# تەفسیری رامان

## لە

## ماناو مەبەستی قورئان

ئەحمەد کاکە مەحموود

چاپی دووەم

١٤٣٠ کۆچیی
٢٠٠٩ زاییینی

# تەفسیری رامان

## لە

## ماناو مەبەستی قورئان

ئەحمەد کاکە مەحموود

چاپی دووەم

١٤٣٠ کۆچیی

٢٠٠٩ زایینی

## ناسنامەی تەفسیر

ناو: تەفسیری ڕامان.
نووسەر: ئەحمەد کاکە مەحموود.
خوێندنەوەو پیاچوونەوەی: عیرفان ئەحمەد کاکە مەحموود.
دیزاینی بەرگ: کەیوان عەبدوڵڵە
دیزاینی ناوەوە: ئیبراهیم مەعروف.
چاپخانە: دار الفکر- بەیروت . لوبنان.
چاپی: دووەم ١٤٣٠ ك - ٢٠٠٩ ز.
تیراژ: ٥٠٠٠ دانە.

## پێشکەش بێت

* بەگیانی پیرۆزی مامۆستا مەلا عوسمان عبدالعزیز / موفەسیری قورئان و دامەزرێنەری بزووتنەوەی ئیسلامیی و ، رابەر و مورشیدی رابوون، کە بە ئیخلاص و ئیمانە پڕ لە ئۆقرەو دڵنیاییەکەی قورئانی لا خۆشەویست کردم هەتا بتوانم ئەم کورتە تەفسیرە بنووسم، بەڵام مەخابن کە فریای پەسەند نامەیەکی نەکەوت بۆی بنووسێت.

* بە دایك و باوکم کە زۆرێك ماندوو و خەستە بوون لە رێی پێگەیاندن و تێگەیاندنم.

* بە خێزان و تاکە تاکەی منداڵەکانم کە بەراستی وەختێکی زۆرم لێگرتن و، وە پشتیوانیکی چاك و دڵسۆزم بوون.

* بە هەموو براو خوشکەکانم کە هەمیشە پاڵپشتم بوون بۆ خوێندن.

* بە هەموو مامۆستا بەرێزەکانم هەر لە ئەلفبێی قورئانەوە تا زانیارییەکانی تر.

* بە هەموو ئەو لاوە ئیماندارانە کە بەخۆشەویستی قورئان گۆش کراون.

## سوپاسنامه

سوپاسی هەموو ئەو بەرێزانە دەکەم هاوکارییان کردم لە ئامادەکردن و نووسینی ئەم تەفسیرە کورتەدا هەر لەتایپ کردنی ، تا پیاچوونەوەو هەڵەگریی ، بەتایبەتی :

* کاك مەلا ( موستەفا محمد جعفر ) کە کات و ساتێکی زۆری لەگەڵ ئەم تەفسیرەدا بردە سەر و ماندو بوو .
* مەلا ( عیرفان )ی خۆمان ، کە بەراستی زۆر بە پەرۆش و بە هەوڵ بوو ، بۆ بەچاپگەیاندنی .
* کاکە هیوای حاجی غەریب کە جاری یەکەم تایپی هەموو تەفسیرەکەی گرتە ئەستۆ ، خوای گەورە بە بەهەشتە بەرینەکەی خۆی شادی بکات .
* کاکە ( محمد )ی خۆمان، کە هەمیشە – بێ سەخڵەت و قەڵس بوون – خەریکی تایپ و پیاچوونەوەو ڕێکخستنی بوو .
* ( هودا ) خانمی کچم ، کە بەشێکی زۆری شەوو ڕۆژی لە شەن و کەودا بوو .

خودای دلۆڤان ، هەموان سەرکەوتوو بکاو چاودێریان بێت .

# پێشەکی چاپی دووەم

الحمدلله، والصلاة والسلام على رسول الله الذى بلغ الرسالة وأدى الأمانة ونصح الأمة وجاهد فى الله حق جهاده ونحن على ذلك من الشاهدين، وعلى آله وصحبه ومن والاه.. سوپاس و ستاییشی بێ پایان بۆ خوای بالاً دەست و بەتوانا، درودو سلاو بۆ سەر گیانی پێشەوای مرۆڤایەتی موحەممەد و یارو یاوەرانی، دوای ئەوەی لەساڵی ١٤٢٧ ی کۆچیی بەرامبەر بە ٢٠٠٧ ی میلادیی و بە ماوەیەکی کەم دوای وەفاتی جەنابی مامۆستا مەلا ئەحمەدی کاکە مەحموود توانرا چاپی یەکەمی تەفسیری رامان بکەوێتە بەردیدی خوێنەران و موسڵمانانی کوردستان، سوپاس بۆ خوا بەشێوەیەکی خێراو شیاو پێشوازییەکی بێ وێنەی لێکراو بوویە جێگای رەزامەندی زانایان بەتایبەتی و گەنجان و لاوان و رۆشنبیران بەگشتیی، وە لە ماوەیەکی زۆر کەمیشدا ئەو تیراژەی کە لێی چاپکرابوو لە کتێبخانەکانی کوردستاندا تەواوبوو، ئەمەش خۆی بۆ خۆی فەزڵ و منەتی پەروەردگارەو جێگای دڵخۆشی ئێمەشە.. پاشان دوای ئەوەی کە ئەم تەفسیرە لە سەرتاسەری کوردستان بلاّو بوویەوە، زۆرێك پێشنیارو روونکردنەوەمان بەدەست گەیشت، لەبەر ئەوە هەستام بە چەند کارێکی گرنگ لەو بارەیەوە، وەك :

١) لا بردنی ئەو نووسخەیەی کە لەتاران سەر لەنوێ تایپ کرابوویەوەو پیاچوونەوەی بۆ کرابوو و دەستنووسە ئەسڵییەکەی مامۆستای رەحمەتیمان لە کۆمپیوتەرەکەیدا وەرگرت و ئەوەمان بۆ چاپی دووەم ئامادە کردەوە.

٢) پیاچوونەوەیەکی وردم بۆ کردەوە لە سوورەتی فاتیحەوە تا سەرەتای سوورەتی (ئیسراء) و هەڵەگیریشم بۆ ئەنجامداوە. داوای لێبووردنیش لە موسڵمانان و خوێنەرانی بەرێز دەکەم کە نەمتوانی لەبەر بێ کاتی بە هەموو تەفسیرەکەدا برۆمەوە، خوا یاربێت بۆ چاپی سێیەم هەمووی ئامادە دەکەم.

٣) گۆرینی دیزاینی ناوەوەو بەرگی تەفسیرەکە.

لە کۆتاییدا زۆر سوپاسی ئەو بەرێزانە دەکەین کە هاوکارییان کردین لە ناردنی تێبینی و روونکردنەوە، خوا یاربێت بە گوێرەی توانا لە چاپی داهاتوودا ئەوەی گونجاو بێت ئەنجامی دەدەین، هەر چەندە پیاچوونەوەو خوێندنەوەی تەفسیرێکی ئاوەها بۆ من کارێکی زۆر زەحمەتەو خۆم بە شیاوی ئەوە نازانم، دەبوو بۆ ئەو کارە گەورەیە لیژنەیەك تەرخان بکرایەو ورد هەڵەگیریی و پیاچوونەوەیان بۆ بکردایە، بەلاّم ئەوەش تەکلیفێکی زۆری دەویست و لە بەرامبەردا مەجبوور بووم بچمە ژێر باری ئەو کارە گەورەوەو انشاءالله بە نیازی کاری باشتریشم لەو بارەوە، وەك لێکۆڵینەوەی ئەو فەرموودانەی کەلەو تەفسیرەدا هاتوون سەبارەت بە لاوازیی و درووستیانەوە، وە زیاد کردنی هەندێك ئەسباب نزول لە سەرەتای سوورەتەکانەوە، وە وەرگێرانی ئەو یاساو ئەحکامانەی کە بە عەرەبی هاتوون بۆ سەر زمانی کوردی وە هەندێ وردەکاری تر.. بۆیە داوای دۆعای خێرتان لێدەکەین.

وصلى الله على خير خلقه محمد وعلى آله وصحبه وبارك وسلم.

عیرفان ئەحمەد کاکە مەحموود

١٥ ی رەجەبی ١٤٣٠ ی کۆچیی

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿ إنَ هَذا القُرآنَ يَهْدى لِلتى هِىَ أقوَمُ ..﴾ الإسراء/٩.

## پێشەکی ئەم بەرهەمە:

لە مێژە ماخۆلانمە بۆ باشتر تێگەیشتن لە قورئانی پیرۆز، بۆ دواییش وەکو ئەرکی سەرشانی خۆم بینووسم و بە دیاریی پێشکەش بە گەلەکەمی بکەم، بۆ ئەوە پتر بە ئەخلاق و ڕەوشت و (قییەم)ـی بەرزو ناوازەی قورئان خۆ برازێننەوە.

بۆ ئەوە ئابوورییەکی پاکژو حەلاڵ و دوور لە گزیی و خیانەت و زیان گەیەنەر بە کۆمەڵگە بنیات بنێ. بۆ ئەوە فێری جیهاد و خەبات و هەوڵ و تێکۆشان - بۆ ئازادیی و سەربەخۆیی و، پاراستنی زمان و فەرهەنگ و کەلتوور و خاك و وڵات و نیشتمانی - ببێ. بۆ ئەوە فێری شێوازی پێکەوە ژیان و هەڵسوکەوت و مامەڵە لەگەڵ یەکدیی ببێ. بۆ پاراستنی قەوارەی یەکرِیزیی و تەبایی و، ئاشتیی و هێمنی و ئاسوودەیی، بۆ دروستکردنی برایەتی و خۆشەویستی لەناو گشت توێژەکاندا، بۆ تەحری سیماو پێکەوەنانی (ئوسرە) و خێزان، بۆ فێربوونی زانست و زانیاریی، بۆ فێربوونی خوا پەرستییەکی ڕاست و ڕەوان و پەسەند لای خوا.

جا لەبەر هەموو ئەمانە، لەوکات و ساتە زۆر ئاڵۆز و شێواوەدا — لە عێراق و لە کوردستان- چوومە ژێر تەکلیف و ئەرکی سەرشانی خۆمەوەو، ئەم کورتە تەفسیرەم - وەکو خزمەتێك بە نەتەوەکەم- نووسی، بە هیواو نومێدی باشتر پێگەیشتن و تێگەیشتن بۆ خزمەتی دین و وڵات و نیشتمان و، تۆکمەتر پێکەوە بوون و پێکەوە ژیان لەژێر سایەی قورئاندا، بەوهیوایە ئەم نەوەیەو نەوەی ئاییندەی نەتەوەی کوردمان ئاشناترو شارەزاتر بێ بە قورئان.. واحاڵی ببێ لێی کەبەرنامەی ژین و رۆژی سەلایە، بەرنامەی جیهادو تێکۆشان و خەباتە، پێڕەوی کارو کارنامەی مرۆڤە، بۆ گشت بزووتن و جمووجوڵێك، ئەم تەفسیرەش بەئەندازەی گیروگرفتەکانی کوردستان، تەگەرە هاتووەتە رێی، بۆیە هەر جورئەی، بەڵکو هەر سوورەتەی بەشێوەو شێوازێکی جیاواز لەوی تر وە بەر هاتووە، هەیە درێژتر و قوڵترە، تێیدایە تەفسیر بەقورئانە، یان بەفەرموودە، یان بەهەردوو، یان بە ڕاوبۆچوونی هاوەڵان، یان پاشینان، هەشیەتی ئاماژە بە هیچ کامێك لەوانە نەکراوە، بەڵام منیش، وەکو چیا سەر بەرزەکانی کوردستان لەبەردەم ئەو هەموو لەمپەرو تەگەرانەدا سەرم دانەنواند و تەسلیم نەبووم، هەتا توانیم — بە یارمەتی خوا- شتێکی ئاوا پێشکەش بە نەتەوەکەم بکەم ، بەو هیوایە بۆ چاپی ئاییندە -خوا یا ربێ- بتوانین تێرو تەسەلترو باشتری بکەین و هەندێ جێگای پێویستی، پتر ڕاڤە بکەین. هەوڵی زۆریشم دا کە تەفسیرێکی پاکژو پوختەتر بنووسم، بەڵام مەخابن ئەوەندە لەمپەرو ئەستەم زۆر بوو سەرنەکەوتم.

زۆریش سپاسی خوێنەرانی هێژا دەکەم کە بە چاوی دڵسوزانەو لێبوردنەوە تەماشای کەم و کورتییەکانی بکەن و ئاگادارمان بکەن لێیان، یان هەر ڕاو بۆچوون و پێشنیازێکیان ببێ، بەدیاریی بینێرن بۆمان، هەتا لە ئاییندەدا بە هەموومانەوە ئەم بەرهەمە بکەینە بەرهەمێکی باشتر و پوختەتر بۆ شکۆفەکانی کوردستان.

سوپاس هەر بۆ خوایە.

دروودو سڵاویش بۆ گشت پێغەمبەران.

ئەحمەد کاکە مەحموود

١٤٢٦/٧/٣٠ ك - ٢٠٠٥/٩/٤ ز

# چەند زانیارییەك لەبارەی قورئانی پیرۆزەوە

**تەفسیر:** بریتیە لە لێکدانەوە و شیکردنەوەی ماناو مەبەستە سەرەکییەکانی قورئانی پیرۆز، پتر لە لێکۆڵینەوە و لێکدانەوە لە لایەنەکانی تری، (وەکو لایەنی ڕێزمان و زمانەوانیی، ڕەوانبێژیی و خۆشخوانیی، فیقهو دەرهێنانی ئەحکامە شەرعییەکان و، دۆعاو نوشتە پێکردنی) تێگەیشتن و، وەرگرتنیەتی وەکو پەیڕەوو بەرنامەی ژیان بۆ هەردوولا (دونیاو قیامەت)، بەگەڕخستنیەتیی لەهەموو دەورو رۆڵێکی ژیانی رۆژانەدا (لەباتی ماچکردنیی و، لەبەرگ هەڵکێشانی و، لەڕەفەدانانی و، خوێندنی لەتازییەو بۆنەکانداو، دانانی لە مێزی دادگاکاندا (بۆ چاوبەسی مەردم). ئەگەرچی ئەم ریزلێنانەش لەخۆیدا! دەنرخێنرێ، بەلام دیارە پاش بە مەنهەجکردنی.

- قورئانی پیرۆز، لە گشت چاخ و سەردەمێکدا لەلایەن زاناکانی هاوچەرخەوە بایەخ و گرنگیی خۆی دراوەتێ و، کتێب و بابەت گەلێکی لەسەر نووسراوە (جەلالەدینی بولقینی) لەکتێبی (مواقع العلوم فی مواقع النجوم)دا دەڵێ: پتر لە(٥٠) زانستی جۆراوجۆر، لەمەڕ قورئانەوە تۆمار کراون.

(سیووتی) - کەلە(٩١١)ی کۆچی کردووە- لە کتێبی (التحبیر فی علم التفسیر) ئەو زانیاریانەی لەبارەی قورئانەوە نووسراون گەیاندوویەتی بە (١٠٢) جۆر، دیارە رۆژ بە رۆژیش تەفسیرو راڤەی قورئان گەشە دەکاو پێش دەکەوێت.

(داودی میسری) -کەلەساڵی (٩٤٥)ی ك، کۆچی دوایی کردووە- لەکتێبی (طبقات المفسرین)دا (٧٠٤) موفەسیری بۆ قورئان ناوبردوە کە تەفسیری قورئانیان کردووە، ئاخۆ دەبێ ئێستا بە چەند گەیشتبن.

**قورئان:** فەرموودەی خوای دلۆڤان و لە کارزانە، بە پێغەمبەرەکەیدا (موحەممەدﷺ) ناردوویەتی بۆ گشت جیهانیان، هەتا بە ژیرانەو فامیدانە لێی حاڵیی بن و، بۆ دونیاو قیامەتیان کاری پێبکەن و، بیکەنە دەستوورو بەرنامەی ژین و مردنیان، رۆشنتر بڵێین: بیکەنە ئەساس و بنەماو ڕەوشی کۆمەڵایەتی و، ڕامیاریی و، ئابووریی و، دامەزراندنی دەسەلات و دەوڵەت، سیاسەتیان لەسەر بنەمای ئایەتی: (وإنك لعلی خلق عظیم) بێت، کلروباری کۆمەڵایەتیی و پێکەوەنانی خێزان و، دەرامەت و دەستخستن و، دابەشکردنی لە ڕێی پاك و حەڵاڵ و ڕەوانەوە بێت، عەدالەت و دادگەریی لە گشت دام ودەزگاکانی دەوڵەتدا ڕەچاو بکرێت، یان کورتتر بڵێین: گشت پەیوەندیی و، جم وجوڵێکی دەوڵەت، یان تاك و کۆمەڵ، لە رووی سیاسەتی قورئان و فەرموودەکانەوە هەڵگۆزرێ و، هەڵسەنگێنرێ، ئەوسا پاش ئەنجامدانی کاری وا، شتێکی جوان وپێویستە بۆ قورئان کە: هەندێ زانستە قورئانیەکانی بەم شێوەیەی خوارەوە فێر ببین:

١- هۆی هاتنە خوارەوە (أسباب النزول)ی ئایەتەکانی قورئان (ئەوبەشەی هۆی هاتنی هەبێت) بزانرێت، بەلام لەگەڵ ڕەچاوکردنی بارە (صحیح) و ڕەوانەکەیدا، چونکە لەتەفسیرەکاندا بەشێکی زۆرو زەبەند، بەناوی (أسباب النزول)ەوە کۆکراوەتەوەو بۆتە ماڵ لەسەرمان، کەچی زۆرێکیشی لەگەڵ واقیعی ئیسلامدا ناگونجێ، لەم داوییەدا بوو شێخ (موقبیل)ی یەمەنیی لەوبارەوە هەوڵێکی زۆریدا، بەلام زۆر کەمی بە (صحیح) دەستکەوت، ئەویتری یان لاوازە، یان هەڵبەسراوە!

٢- لە موناسەبەو پەیوەندی نێوان ئایەتەکان بکۆڵینەوە، بۆ ئەمەش سوود لە (التفسیر الکبیر) و (فی ظلال القرآن) و (البرهان) وەربگیردرێ.

٣- ئەو بێژەو وشانە -کە بۆ چەند ماناو مەبەستێك هاتوون- لێکبدرێنەوە، بۆ نموونە: بێژەی (هدی) بۆ پتر لە (٢٠) مانای جیاواز هاتووە.

٤- زانینی (تشابە) لەنێوان وشە لێکچووەکاندا، بۆ نموونە: (قل إن هدی الله هو الهدی) لە جێگایەکی تردا (قل إن الهدی هدی الله)، یان (أنی یکون لی ولد) لەجێگایەکی تردا (أنی یکون لی غلام).

٥- سەرەتاو کۆتایی سوورەتەکان هەڵسەنگێنرێت، چونکە ئەر بە وردی تەماشای ئەو ڕووەی قورئان بکرێت، روون دەبێتەوە کەسەرەتای سوورەتەکە، لەچی دەدوێ، کۆتاییەکەیشی هەر لەوە دەدوێت، کە ئەمەش پەیوەندی سوورەتەکە پێکەوە جۆش دەدا.

٦- جیاکردنەوەو ناسینی سوورەتە (( مەککی ) و ( مەدەنی )یەکان، بۆ ئەمەش قسەی راست ئەوەیەکە:

هەر بەشێك لە قورئان –بەر لەهیجرەت- هاتبێ، دەبێتە مەککیی، ئەویشی پاش کۆچ و هیجرەت کەوتبێت، دەبێتە ( مەدەنیی )، شیاوی باسە تەرتیب و ڕێکخستنی ئایەتەکان –لەهەر سوورەتێکدا- ( تەوقیف ) یە و بەفەرمانی پێغەمبەرە ﷺ، واتە: نابێ ئایەتی سوورەتێ ببرێ بۆ سوورەتێکیتر، وەیان شوێنگۆڕکێی پێبکرێت، بەڵام مەسەلەی هێنانەوەو ڕێخستنی سوورەتەکان –بەم شێوەیە کە ئێستا هەیە -بە فەرمانی خەلیفە ( عوسمان ) بوو ﷺ ( ئەڵبەت ئەویش بە حزووری هاوەڵە پسپۆڕەکانی قورئان بوو، ئەو کارەیەی ئەنجام دا، گشت رایان لەسەر داوبوو بە( ئیجماع )، ئەگینە سوورەتەکان لە بنەرەتدا بەم شێوەیەی خوارەوە دابەزیوون:

**سوورەتە مەککییەکان:** ( عەلەق، قەلەم، موززەممیل، موددەسسیر، مەسەد، تەکویر، ئەعلا، لەیل، فەجر، زوحا، ئینشیراح، عەصر، عادیات، کەوسەر، تەکاسور، ماعوون، کافیرون، فیل، صەمەد، نەجم، عەبەسە، قەدر، بروج، تین، قورەیش، قاریعە، قیامە، هومەزە، مورسەلات، قاف، بەلەد، طاریق، قەمەر، صاد، ئەعراف، جین، یاسین، فورقان، فاطیر، مەریەم، تاها، واقیعە، شوعەرا، نەمل، قەصەص، ئیسراء، یوونس، هوود، یووسف، حیجر، ئەنعام، صافات، لوقمان، سەبەء، زومەر، غافیر، شوورا، فوصصیلەت، زوخروف، دوخان، جاسیە، ئەحقاف، زاریات، غاشیە، کەهف، نەحل، نووح، ئیبراهیم، ئەنبیاء، مؤمینون، سەجدە، طوور، مولك، حاققە، مەعاریج، نەبەء، نازیعات، ئینفیطار، رووم، عەنکەبووت ).

**مەدەنییەکانیش:**

( بەقەرە، ئەنفال، ئالی عیمران، ئەحزاب، مومتەحینە، نیساء، زەلزەلە، حەدید، موحەممەد، رەعد، رەحمان، دەهر، تەلاق، بەیینە، حەشر، فەلەق، ناس، نەصر، نوور، حەج، مونافیقون، موجادەلە، حوجورات، تەحریم، صەف، جومعە، تەغابوون، فەتح، تەوبە، مائیدە، ) ئەم سەرژمێرییەشمان بۆ مەککیی و مەدەنیی، بە پێی هەندێ ڕیوایەتە.

٧- زانینی سەرەتاو کۆتایی و، ئاخر بەش لە قورئان، بۆئەمە زاناکان کێشەیان نییە، کەسەرەتای سوورەتی ( عەلەق ) یەکەم بەش بوو لە قورئان لە ( حیراد )ا بۆ پێغەمبەر ﷺ هاتووە.

٨- قورئان بە ( ١٠ ) شێوە ( قراءات العشر ) دەخوێنرێتەوە، دیارەکە ئەگەر بەدەرلەم دە شێوەیە هەبوو، ئەوە بە( قرائة الشاذة ) دادەنرێ و، وەکو قورئان کاری پێناکرێ، بۆ نموونە: خوێندنەوەی ( إنما يخشى اللهُ من عباده العلماءُ... ) بە( إنما يخشى اللهَ من عباده العلماءَ ) بەڵام وەکو فەرموودەیەك وەردەگێردرێت و کاری پێدەکرێ.

٩- نیوەی یەکەمی قورئان لە فاتیحەوەیە، هەتا ( نوون )ی ( لقد جئت شيئاً نكرا )ی سوورەتی ( کەهف ) یان ( ف )ی ( وليتلطف )ی هەمان سوورەت.

١٠- ئایەتەکانی قورئان ( ٦٥٠٠ ) ئایەتە، نیوەی یەکەمی لە ( فاتیحە )وە دەست پێدەکات، بۆ ئایەتی ( فألقى عصاه فإذا هي تلقف ما يأفكون )ی سوورەتی ( شوعەرا )، لەوێشەوە بۆ کۆتایی سوورەتی ( ناس ) بەشی ئاخریەتی.

١١- وشەکانیشی: ( ٧٧٤٣٩ ) وشەیە، بێژەی ( ألله )ی پیرۆزیش ( ٩٨٠ ) جار هاتووە، بە پێی ئاماری ( محمد فواود عبدالباقي ).

١٢- پیتەکانی: ( ٣٢١١٨٠ ) پیتە.

( نەسەفی ) لە کتێبی ( مجموع العلوم و مطلع النجوم )دا هەوڵێکی زۆری داوە بۆئەوەی بزانێت هەریەك لە پیتەکانی قورئانی پیرۆز، چەند جار لە قورئاندا هاتوون، کە دیارە ئەمەیش ئەوپەڕ بە تەنگەوە هاتنی زاناکان نیشان دەدا بەددم قورئانەوە، جا

دەرەنجام بەم شێوەیەی خوارەوە راپۆرتی داو گوتی:

| | |
|---|---|
| أ (ئەلیف): | ٤٨٧٤ جار هاتووە. |
| ب (بێ): | ١١٤٢٠ جار هاتووە. |
| ت (تێ): | ١٤٠٤ جار هاتووە |
| پ (پـێ): | ١٠٤٨٠ جار هاتووە |
| ج (جیم): | ٣٣٢٢ جار هاتووە |
| ح (حێ): | ٤١٣٨ جار هاتووە. |
| خ (خێ): | ٢٥٠٣ جار هاتووە. |
| د (دال): | ٥٩٩٨ جار هاتووە. |
| ز (زال): | ٤٩٣٤ جار هاتووە. |
| ڕ (ڕێ): | ٢٢٠٦ جار هاتووە. |
| ژ (ژێ): | ١٦٨٠ جار هاتووە. |
| س (سین): | ٥٧٩٩ جار هاتووە. |
| ش (شین): | ٢١١٥ جار هاتووە. |
| ص (صاد): | ٢٧٨٠ جار هاتووە. |
| چ (چاد): | ١٨٨٢ جار هاتووە. |
| گ (گـێ): | ١٢٠٤ جار هاتووە. |
| ڤ (ڤـێ): | ٨٤٢ جار هاتووە. |
| ع (عەین): | ٩٤٧٠ جار هاتووە. |
| غ (غەین): | ١٢٢٩ جار هاتووە. |
| ف (فێ): | ٩٨١٣ جار هاتووە. |
| ق (قاف): | ٨٠٩٩ جار هاتووە |
| ك (كاف): | ٨٠٢٢ جار هاتووە. |
| ل (لام): | ٣٣٩٢٢ جار هاتووە. |
| م (میم): | ٢٨٩٢٢ جار هاتووە. |
| ن (نوون): | ٧٠٠٠ جار هاتووە. |
| ه (هێ): | ٢٦٩٢٥ جار هاتووە. |
| و (واو): | ٢٥٥٠٦ جار هاتووە. |
| لا (لام ئەلیف): | ١٤٧٠٧ جار هاتووە. |
| ی (ێ): | ٢٥٧١٧ جار هاتووە. |

١٣- ڕێنمایی بۆ تەفسیر كردن: هەتا دەست بداو بگونجێت، تەفسیر بە قورئان بكرێت، خۆ ئەگەر توانای ئەوە نـەبوو، ئەوسـا بـە فەرموودەكان، پاشان بە وتەو قسەی هاوەڵان، ئەوجا تەفسیری پاشینان (تابعین) وەكو: (موجاهیـدی كـوڕی جەبـەر، سـەعدی كـوڕی جوبەیر، عیكرمەی بەندەی ئیبن عەباس) عـەتای كـوڕی ڕەبـاح، شـێخ حەسـەنی بەصریی، مەسـروق، سـەعدی كوڕی موسـەییب،

ئەبەلعالیه، ڕەبیعی کوڕی ئەنەس، قەتادە، زەحاکی کوڕی موزاحیم ) و دەیان زانای تر، ئەگەرچی دەگونجێ لە هەندێ جێگادا ( ئیسرائیلیات ) وە ( ئەصرانییات ) تێکەڵ بە تەفسیرەکانیان کرابێ، بە تایبەتی ئەگەر لە ( عەبدوڵلای کوڕی سەلام ) و ( کەعبولئەحبار ) و ( وەهبی کوڕی مونەبیە، عەبدولمەلیکی کوڕی عەبدولعەزیزی کوڕی جورەیج ) ڕیوایەتیان کردبێت، شیاوی باسیشە هەر ناوچەو وڵاتێك ( ئیمام ) و پێشەوایەکی هەبووەو، ڕیوایەتیان لێوە کردووەو تەقلیدو لاسایی ئەویان کردۆتەوە، بۆ نموونە : لەمەککەدا ( عەبدوڵلای کوڕی عەباس ) سەرقافڵەو پێشەنگی ڕاڤەکەرانی قورئان بووەو گوێیان بۆ ئەو گرتووەو لەو پەیڕەوییان کردووە، پاشان شاگردو قوتابییەکی زۆریشی پێگەیاندووەو، جێی ئەویان گرتۆتەوە، وەك : ( سەعیدی کوڕی جوبەیر، کە مخابن ساڵی ( ٩٥ )ـی کۆچی بەدەستی حەجاج ) شەهید کرا! یا ( موجاهیدی کوڕی جەبر ) کە ساڵی ( ١٠٤ )ـی کۆچی ماڵئاوایی کردو دنیای بەجێهێشت، یان ( تاوسی کوڕی کەیسانی یەمەنیی ) ساڵی ( ١٦٠ )ـی ك، کۆچی دوایی کرد، یان ( عیکرەمە ) ساڵی ( ١٠٤ )ـی کۆچیی، گەڕاوە بۆ لای خوا، یان ( عەتای کوڕی ئەبی ڕەباح ) کەساڵی( ١١٤ )ـی ك، کۆچی کرد، خوای دلۆڤان لە گشت خۆش ببێت.

لە مەدینەیشدا ( ئوبەی کوڕی کەعب ) بوو بە مامۆستاو پێشەوایان و گوێیان بۆئەو دەگرت و چاو لەو دەکرا، ئەمانەش شاگردە هەڵکەوتووەکانیەتی : ( ڕوفەیعی کوڕی مەهران ) کە ساڵی ( ٩٠ )ـی ك، کۆچیی دوایی کرد.

دووەم : ( موحەممەدی کوڕی کەعب )ـی ( قورەیزی / ١١٨ ك ) کۆچی دواییکرد.

سێیەم : ( زەیدی کوڕی ئەسلەم / ١٣٦ ك ) ماڵئاوایی کرد. خوا لێیان خۆشبێت.

* لە ( عێراق )یشدا ( عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود ) پێشەواو قسە ڕەواج بوو و، خەڵکیی لەوەوە قورئانیان وەرگرت و، زۆرێکیش ڕیوایەتیان لێوە کردووە، خوای میهرەبان سەربەرزی قیامەتیان بکات.

( سیووتی ) لە کتێبی ( ئیتقان )دا دەڵێت : ناودارو هەڵکەوتوانی هاوەڵان بۆ تەفسیری قورئان، ئەم ( ١٠ ) کەسەن : ( ئەبووبەکری صدیق، عومەری کوڕی خەتاب، عوسمانی کوڕی عەفان، عەلی کوڕی ئەبی تالیب، ئیبن عەباس، ئیبن مەسعوود، ئوبەی کوڕی کەعب، زەیدی کوڕی سابت، ئەبو مووسای ئەشعەری، عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر ) بەشێك لەخوار ئەمانەیشەوە خەڵکێکی زۆر بوون، وەکو : ( ئەنەسی کوڕی مالیك، ئەبوو هورەیرە، ئیبن عومەر، جابری کوڕی عەبدوڵلا... هتد ) دیسان خوای بەبەزەیی لەهەموان خۆش بێ و سەریان بەرز بکاتەوە لە ڕۆژی پەسڵان و بەری.

- تەفسیر لەئاخری تەمەنی ( بەنی ئومەیە )و سەرەتای سەرهەڵدانی ( عەباس )ییەکاندا نووسرایەوە، بەڵام ( فەرموودە ) بەرلەوە دەستی کرد بە نووسینەوە، گرنگییەکی ئێجگار زۆری پێدراو کرابە چەند ( باب )ێك، تەفسیریش ( باب )ێکی بوو، ئیتر وەکو ئێستا لەسەرەتاوە بۆ کۆتایی سوورەت بەسوورەت ئایەت بە ئایەت تەفسیر نەکرابوو، دوایی کۆمەڵێکی زۆر هەڵسان بە تەفسیر کردنی، بەڵام بەشێوەی کتێب نەکەوتە ناو، ئەوسا بۆ دواتر دەستەیەك هاتن وەکو : ( ئیبن ماجە /٢٧٣ م )، ئیبن جەریر )ی تەبەریی ( ٣١٠ م ) ئەیسابووریی ( ٣١٨ م )، ( ئیبن ئەبی حاتەم / ٣٢٧ م ) تەفسیریان کردو ( ئیسناد )یان دایە لای، ئەوەی ڕیوایەتیان لێوەکردووە، لە پێغەمبەرەوە ﷺ ( ، یان لەهاوەڵان، یان لە پاشینان، دوای ئەمانەش هەندێکیتر پەیدابوون ( ئیسناد )ەکانیان کورت کردەوەو بێ ئەوەی بڵێن قسەی فلانەکەسە، لەمەوە وای لێهات ڕیوایەتی ڕاست و ناڕاست لەیەك ئاڵۆزان و جیا نەدەکرانەوە.

**- تەفسیر دووبەشە :**

**یەکەم : تەفسیر بە ( ئەسەر ) وەکو ئەمانە :**

١- تەفسیری ئیبن عەباس.

٢- تەفسیری ئیبن عویەینە.

٣- تەفسیری ئەبی حاتەم.

٤- تەفسیری ئەبی شەیخی ئیبن حیببان.

٥- تەفسیری ئیبن عەطیە.

٦- ئەبی لەیسی سەمەرقەندیی ( بحر العلوم ).

٧- ئەبی ئیسحاق ( آلکشف والبیان عن تفسیر القرآن ).

٨- ئیبن جەریری تەبەریی ( جامع البیان فی تفسیر القرآن )

٩- ئیبن ئەبی شەیبە.

١٠- (معالم التنزیل ) بەغەویی.

١١- (تفسیر القرآن العظیم ) ئیبن کەسیر.

١٢- (الدر المنثور ) سیووتی.

١٣- (فتح القدیر ) شەوکانی.

دووەم: تەفسیر بە ڕەئی: واتە: لێکدانەوەی قورئان بە ڕاوبۆچوونی لێکدەرەوەکە، بێ ئەوە لەگەڵ ڕۆحی شەریعەتی ئیسلامدا بخوات! بێگومان تەفسیری وا لە هێڵە سەرەکییەکانی قورئان دەچێتە دەرێ و، دەکرێتە خزمەتکاری ڕاوبۆچوونی ( موفەسسیر )ـەکەو لەسەر ( مەزهەب ) و بیرۆکە ی خۆی –نەك هاوەڵان و پاشینانیان- تەفسیری دەکات، وەکو تەفسیری ( زەمەخشەریی و، جوببایی و، ئیبنولئەصەم و، ئیبن عەرەبیی )، زەمەخشەریی تەفسیرەکەی خۆی پڕکردووە لە ڕاوبۆچوونی ( مەعتەزیلە )کان، ( ئیبن عەرەبی )یش –کەناوبانگی بەموفەسسیرێکی صۆفی دەرکردووە- بەئارەزووو مەیلی خۆی سوورەت و ئایەتەکانی لێکداوەتەوە، بۆ نموونە: لە تەفسیری ئایەتی: ( ورفعناه مکانا علیا ) مەریەم /٥٧ دەڵێ: جێگەی ڕۆحانیەتی ( ئیدریس / علیه السلام ) خولگەی ڕۆژە ( فلك الشمس )! دەتوانی پتر لە کتێبی ( التفسیر والمفسرون )ـی دکتۆر زەهەبیی، سوود وەرگریت، دیارەکە تەفسیری وا، حەرامەو ڕێی پێنەدراوە، ئەمانەش برێکی ئەو تەفسیرانەن:

- ئەبی عەلی جوببایی.
- ئیبنولئەسەم.
- ئیبن عەرەبیی.
- زەمەخشەریی ( خوارەزمی عێراقیی ).
- نەسەفیی.
- خازن.
- ( بحر المحیط ) ئەبی حەیان.
- بەیزاویی.
- جەلالەدین.

## وەرگێڕانی قورئان: ( ترجمة القرآن ):

قورئان وەرگێڕان دووبەشە:

یەکەم: پیت بە پیت و( حرفیی )ـە، ئەمیش بریتییە لەوەرگێڕانی بێژەو وشەکان، لەزمانێکەوە بۆ زمانێکیتر، بەشێوەیەك لە هۆنینەوەو ڕێکخستنندا پڕبە پڕ لەیەك بچن.

دیارە ئەوانەی کە شارەزای زمانن و، ئاگاداری ڕێزمانن، چاك دەزانن کە: وەرگێڕانی ئاوا هەرگیز وەکو وەرگێڕاوەکە –لەگشت ڕوویەکەوە- دەرناچێت، چونکە هەموو زمانێك شێوەی تایبەتی خۆشخوانیی و ڕەوانبێژیی و، ڕێزمانیی خۆی هەیە، زاناکان دەڵێن: وەرگێڕەکە هەرچەند بالأدەست بێت لە وەرگێڕاندا، وەرگێڕاوەکە ناگات بە پلەی وەرگەڕاوەکە، بۆیە بەلایانەوە کاری وا، حەرام و

نارەوایەو نابێ دەرفەت بدرێت.

دووەم: وەرگێڕانی تەفسیری مەوزوعییە، واتە: گەیاندنی ماناو مەبەستی قورئانەکەیە بە دەستەواژەیەك نزیك بێت لە دەقی قورئانەکەوە، بێ شك وەرگێڕان و تەفسیری وا دروست و ڕەوایە، (ئیبن تەیمییە) دەڵێت: (وأما مخاطبة أهل الإصطلاح باصطلاحهم و لغتهم فليس بمكروه إذا أصبح إلى ذلك، وكانت المعاني صحيحة، كمخاطبة العجم من الروم و الفرس و الترك بلغتهم و عرفهم، فإن هذا جائز حسن للحاجة، و إنما كرهه الأئمة إذا لم يحتج إليه..) هەر لەبەر ئەمەش بوو پێغەمبەرﷺ (فەرمانی بە (زەیدی کوڕی سابیت) کرد، بچێ فێری شێوە نووسینی زمانی (یەهوود) ببێ! جا هەرلەم سۆنگەشەوە زاناکان -بەدەر لە ئەبی حەنیفە- ئەگەرچی دەڵێن پەشیمان بۆتەوە -ڕێگە نادەن نوێژ بە غەیرەز عەرەبیی بخوێنرێت.

لەکۆتاییشدا لەخوای کارجوان و باڵادەست دەخوازین، موسڵمانان پتر ڕوو بکەنەوە قورئان و سوننەتی پێغەمبەرﷺ (، هەر وەکو چەرخی یەکەم وەری بگرن و کاری پێبکەن.

سەرچاوەی ئەم چەند زانیارییە لەبارەی قورئانەوە:

١- (إتحاف الإخوان بخلاصة علوم القرآن) نووسینی بەڕێز: جەنابی (مامۆستا مەلا عوسمان عبدالعزیز)ـی ڕەحمەتیی.

٢- مقدمة التحقيق (محمد إبراهيم البنّا) لێکۆڵەرەوەی (ئیبن کەسیر).

٣- مقدمة إبن كثير (تەفسیری ئیبن کەسیر).

٤- پێشەکیی قورتوبیی، چاپی ١٩٩٣ ز - ١٤١٤ ك.

٥- مباحث في علوم القرآن (منّاع القطان).

٦- حاشية الجمل على الجلالين.

## ١- سوورەتی ( فاتیحه )

### مەككەیی یەو ( ٧ ) ئایەتە، ( ٢٥ ) وشەیە، ( ١١٣ ) پیتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتە لەبەرئەوە لەدانانی ڕیزبەندی سورەتەكانی قورئاندا – نەك لەهاتنە خوارەوەدا- لەسەرەتای قورئانەوەیە پێی دەڵێن: سوورەتی (فاتیحە) و(أم الكتاب) دایكی كتێبان، لەفەرموودەیەكدا --ترمزیی ریوایەتی كردووە- دەفەرمویٚ: ((الحمدلله رب العالمین أُمُّ القُرآنِ، وأُمُّ الكتابِ، والسَّبْعُ المثانی والقرآنُ العَظِیمُ)). ئەم سوورەتە لە گەڵ كەمی ژمارەی ئایەتەكانییدا، ماناو مەبەستێكی ئێجگار فراوان و زۆر گرنگ دەگەیەنیٚ، هەرلە بناغە سەرەكییەكانی ئیسلامەوە، هەتا پایەو لقەكانی، ئینجا ئیمان و بیروباوەڕ، ئەوسا خواپەرستیی، ڕێكخستنی ئەحكامەكان، ڕۆژی دوایی و رستاخێز، ناوو سیفەتە جوانەكانی خواو وەرگرتنی یارمەتی هەرتەنها لەخۆی، خواپەرستیی تەنها هەر بۆئەو، داوای دامەزراندن و سەقامگیر بوون لەسەر ڕێگەو ڕێبازە ڕاستەكەی ئیسلام ڕێگەی پەیامبەران و، پیاوچاكان و، خۆشەویستان و دۆستانی خوا، خۆ دوورگرتن لەهەموو ڕێگە لاروخێچەكان، لەگش ڕێچكەو تولە ڕێگاكان، هەر لەبەر ئەمەیشە خوێندنی لە نوێژەكاندا پێویست و واجیب كراوە، وە بەگەورەترین و بەپیتترینی سوورەتەكانی قورئان لەقەڵەم دراوە، چونكە لەبوخارییدا هاتووە: ((لَأُعَلِّمَنَّكَ سورة هی أعظمُ السُّوَرِ فی القرآن: الحمد لله رب العالمین، هی السبعُ المثانی والقرآنُ العظیمُ الذی أُوتِیتُهُ)) واتە: سوێند بەخوا سورەتێكت فێر دەكەم كەلەهەموو سوورەتەكانی قورئان مەزنترو گەورەترە.




### دەبیٚ هەموو كاریٚ هەر بە ناوی خواوە بیٚ:

بەڵیٚ خوای گەورەو میهرەبان لەم سوورەتە كورتەدا مرۆ تێدەگەیەنێت كە دەبیٚ هەموو ئیش و كارو جم وجووڵ وبزووتن و هەوڵ و خەبات و تێكۆشانێكی تەنیاو تەنیا بە ناوی ئەوەوە بیٚ و، هیچ شتێكی تری ئاوێتە نەكریٚ، ئەگینە دەبێتە كوفرو شیرك، چونكە بتپەرستەكانی ئەو دەمەش ناوی خوایان دەهێنا، بەڵام ناوی شتی تریشیان دەخستە پاڵی، بۆیە خوای باڵادەست لەم سەرەتای قورئانەوە فێرمان دەكاكە: نابیٚ ئێمەش بەهەڵەو پەڵەی موشریكاندا بچین، بۆیە بەم شێوەیە دەفەرمویٚ: ﴿١ بسم الله﴾ تەنهابەناوی خواوە ئەم سوورەتە ئەنێرمە خوارەوە، دەسا ئێوەش (ئەی ئیمانداران!) لەتەواوی جم و جوڵ و ئیش و كارەكانتاندا هەر بەناوی خواوە كاربكەن، (نەك بەناوی پاشاو سەرۆك و خاوەن هێزەكان و هەرشتیٚ ترەوە) وەهەر بۆ ئەو بكۆشن و هەوڵ بدەن، چونكە هیچ كەسێكی تر – بێجگە لەخۆی- هیچ شتێكی بەدەست نییەو، هیچ كارێكیش بەبیٚ ئەو پیرۆز نابێت، ﴿الرحمن

الرحیم﴾ بەخشەرو بە بەزەیی و دڵاوایە. ﴿[٢] الحمدلله﴾ تەواوی جۆرەکانی سوپاس و ستاییش تەنها هەر بۆ خوایە ﴿رب العالمین﴾ کەپەروەردگاری ئادەمیی‌و فریشتەو گشت ئاسمانەکان و زەویی و بوونەوەرە، پەروەردگاری تەواوی جیهانەکانە، کەوابوو ئایینەکەشی پەیام و نامەیەکی عالەمییە. ﴿[٣] الرحمن الرحیم﴾ بەخشندەی بە بەزەیی میهرەبانە. بەزەییەکەی ئێجگار فراوانە، میهرەبانییەکەیشی بەردەوام و نەبڕاوەیە ﴿[٤] مالك یوم الدین﴾ خاوەنی ڕۆژی پاداشت و تۆڵەیە، کەسێکی ترنییە – بێجگە لەو– شتێکی بەدەست بێت" بەتایبەتی لەو ڕۆژەدا، وەکو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: (یوم لاتملك نفس لنفس شیئا والأمر یومئذ لله) ١٩/٨٢..

## دەبێ تەنیا بە بەرنامەی خوا کار بکەین:

بەڵێ پێویستە باشتر لە قورئانی پیرۆز وردبینەوەو تێبگەین، تا ڕێك وپێك ترو قووڵتر خۆمانی تەسلیم بکەین و، لەهەموو ئیش و کارەکانماندا هەر پەیڕەوی لەو بکەین، دەبێ هەرچۆنێ نوێژو ڕۆژووو حەجمان بە بەرنامەی خوا بەڕێوە دەبەین، هەرئاواش سیاسەت و ئابووریی و، کاری کۆمەڵایەتیی و فەرهەنگیشمان هەر بەو پێوەندە بێت، بۆیە فەرمانمان پێدەکاو، پێمان دەڵێت کە: بەزمان ولەناخیدەڵەوە بڵێین: ﴿[٥] إیاك نعبد﴾ خوایە تەنها هەر ئەتۆ دەپەرستین، تەنیا بەرنامەو پرۆگرامەکەی تۆمان لاپەسەندە، هەر گوێ ڕایەڵ و ملکەچی تۆ دەبین، یەکتاپەرستیی (توحید الألوهیە)ی ڕاستەقینە – کە گەلێ کەس تێیدا دەکەوێتە هەڵەو، هەڵە دەبێ– بەم شێوەیە جێبەجێ دەبێ و لەلای خوا قبووڵە ﴿وإیاك نستعین﴾ وە تەنها هەر لەتۆ داوای یارمەتیی و کۆمەك دەکەین، تەنها ئەتۆی کەبتوانی لەڕۆژە سەختەکاندا یارمەتیمان بدەیت و سەرمان خەیت بەسەر دوژمنی خۆت و ئێمەدا، (توحید الربوبیە)ی ڕاستەقینەش ئەمەیەو، دەبێ هەموو شتێکمان بیگێڕینەوە بۆلای خوا ﴿[٦] إهدنا الصراط المستقیم﴾ خوایە ڕێنماییمان بکە بۆ ڕێگەو ڕێبازە ڕاستەکەی خۆت کەئایینی پیرۆزی ئیسلامەو شارەزامان بکە، وەهەر لەسەر ئەوڕێیەش بەهەمیشەیی سەقامگیرو دامەزراومان بکە ﴿[٧] صراط الذین أنعمت علیهم﴾ ڕێی ئەو کەسانەی کەنازو نیعمەت و بەخششی خۆتت بەسەردا ڕشتوون –لەپەیامبەران و، ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکان– ﴿غیر المغضوب علیهم ولاالضالین﴾ نەك ڕێی ئەوانەی کە خەشم و قینی تۆیان بەسەردا ڕژا وەك گەلی یەهوود، وە نەك ڕێی ئەوانەیش کە گومڕاو سەرلێشێواو بوون، وەك گەلی گاوران. سەبارەت بە فەزڵ و گەورەیی ئەم سوورەتە گەلێ فەرمووده هەیە، لەوانە پێشەوا (ئەحمەد) گێڕاویەتیەوە: ((والذی نفسی بیده ماأنزلَ الله فی التوراة ولا فی الإنجیل ولا فی الزبور ولا فی الفرقان مِثْلَها، هی السبعُ المثانی والقرآنُ العظیمُ الذی أُوتیتُهُ)). سوێند بەخوا نەلەتەورات و، نەلە ئینجیل و، نەلە زەبوورو، نەلەفورقاندا سوورەتێکی تر وەکو ئەم سوورەتی (فاتیحە) یە کە بە من دراوە، نەهاتووە.. جاتۆیش (ئەی ئیماندار!) زۆر بە وردیی و ملکەچکردنەوە بیخوێنەو پەیڕەویی بکە.

## بسم الله.. بە هێواش، یان بە دەنگی بەرز بخوێنرێ؟:

لەبارەی (بسم الله الرحمن الرحیم)ـەوە: هەمیشە هاوەڵان بە (بسم الله الرحمن الرحیم) قورئانیان دەس پێدەکرد، وە بەکۆ دەنگی هاوەڵان (بسم الله الرحمن الرحیم)ـی سوورەتی (نەمل) ئایەتێکە لەئایەتەکانی قورئان، بەڵام ئەمە کەلەسەرەتای هەموو سوورەتەکانەوە (بسم الله..) هەیە، ئایا ئایەتێکی سەربەخۆیە؟ یابەشێکە لەسەرەتای هەرسوورەتێ کەتێیدا نووسراوە؟ یان تەنها بەشێکە لەسوورەتی (فاتیحە)؟ یان هەرئایەتێك نیە لەقورئان؟ بەڵکو تەنها بۆجیاکردنەوەی سوورەتەکانە لە یەکدی. جابۆ ئەم وەڵامانە زانایانی پێشینان و پاشینان دەربارەی هەر یەك لەوبۆچوونانە قسەیان جیاوازە، بۆ نموونە: (ئیبن عەباس) دەڵێ: (إن رسول الله ﷺ کان لایَعْرِفُ فصلَ السورةِ حتی

يَنْزِلَ علیە (بسم الله الرحمن الرحیم). (ئەبی‌داود: کتاب الصلاة ٢٠٩/١) واتە: پێغەمبەر ﷺ سەرەتای سوورەتەکانی قورئانی بۆ لێك نەدەکرایەوە، هەتا (بسم الله..) دەهات. ئەبوعەبدالله ی نیشابووریی(حاکیم) ئەم ریوایەتەی لە (مستدرك)دا هێناوە. وەلە (صەحیح)ی (ئیبن خوزەیمە)شدا لە (ئوم سەلەم)ـەوە هاتووە: ((إن رسول الله ﷺ قرَأَ البَسْمَلَةَ فی أول الفاتحة من الصلاة وعدّها آیة)) کە پێغەمبەر ﷺ لە گشت نوێژەکانیدا لەسەرەتای (فاتیحە)ـەوە (بسم الله..)ی دەخوێندو بە ئایەتێکی فاتیحەشی دادەنا. (ئیبن کەسیر) دەڵێ: (عەمری کوڕی هاروونی بەڵخیی)ش ئەمە ریوایەت دەکا، بەڵام ڕیوایەتەکەی لاوازە، جا ئەو هاوەڵانەی لێیان ئەگێڕنەوە کە(بسم الله..)یان بەئایەتێك لە گشت سوورەتەکان داناوە بێجگە لە سوورەتی (بەرائەت)، ئەم بەڕێزانەن: (ئیبن عەباس، ئیبن عومەر، ئیبن زوبەیر، ئەبوو هورەیرە، عەلی ئەبی تالیب). لە پاشینانیش (تابعین): (عەتا، تاوس، سەعیدی کوڕی جوبەیر، مەکحوول" زەهری، عبدالله ی کوڕی موبارەك ، شافیعیی، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، ئیسحاقی کوڕی راهوەیە، ئەبو عوبەیدولقاسم، ئیبن سەلام-ڕەحمەتی خودایان لێ بێ- بەڵام پێشەوا (مالیك و ئەبی حەنیفە)و، هاوەڵانیشیان دەڵێن: نەلە فاتحەو، نەلە غەیری فاتحەدا ئایەت نییە. **جا ئاخۆ لەنوێژدا بەدەنگی بەرز دەخوێنرێ؟ یان بەدەنگی نزمو هێواش؟**

بەڵێ ئەوانەی پێیان وایە ئایەتێك نیە لەسوورەتی فاتیحە، دەنگی بۆ بەرز ناکاتەوە، هەروەها ئەوکەسەش دەڵێ بەشێکە لەسەرەتای فاتیحە، ئەوانەش کە دەڵێن بەشێکە لەسەرەتای گشت سوورەتەکان لە نێو خۆیاندا قسەیان جیاوازە، پێشەوا شافیعیی و، زۆرێك لەهاوەڵان وەك: (ئەبوهورەیرە، ئیبن عومەر، ئیبن عەباس، موعاویە، ئیبن عبدالبرّ و بەیهەقیی لە عومەرو عەلی)یەوە ئەیگێڕنەوە، وە لە ریوایەتێکی (غەریب)یشدا هاتووە کە هەر چوار خەلیفەکەش بەدەنگی بەرز لەنوێژا خوێندویانە. لە (تابعین)یشدا ئەم بەڕێزانە بەدەنگی بەرز خوێندوویانە: (سەعیدی ئیبن جوبەیر، عیکرەمە، ئەبو قەلابە، زەهریی، عەلی کوڕی حوسەین، موحەممەدی کوڕی عەلی، سەعیدی کوڕی موسەییەب، عەتا، تاوس، موجاهید، سالم، موحەممەدی کوڕی کەعبی قورەزیی، ئەبی بەکری موحەممەدی کوڕی عەمری کوڕی حەزم، ئەبی وائیل، ئیبن سیرین، موحەممەدی کوڕی مونکەدیر، عەلی کوڕی عبدالله ی کوڕی عەباس، موحەممەدی کوڕی نافیعی بەندەی ئیبن عومەر، زەیدی کوڕی ئەسلەم، عومەری کوڕی عەبدولعەزیز، ئەزرەقی کوڕی قەیس، حەبیبی کوڕی ئەبی سابیت، ئەبی شەعسا، مەکحوول، عەبدوڵڵای کوڕی مەعقیل، وەئیمامی بەیهەقیی، عەبدوڵڵای کوڕی سەفران و موحەممەدی کوڕی حەنیفەشی زیاد کردووە. بەڵگەشیان ئەوەیە کە: (١) ئەبوو هورەیرە لەنوێژێکیدا بەدەنگی بەرز (بسم الله..)ی خوێند، کاتێکیش لێبوویەوە، وتی: ئەم نوێژەم پڕ بە پڕ وەکو نوێژی پێغەمبەر بوو ﷺ . نەسایی: کتاب الإفتتاح ١٣٤/٢. (٢) .ئیبن عەباس دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ (بسم الله الرحمن الرحیم)ی بەدەنگی بەرز دەخوێند. (ئەبوو داود، ترمزیی). (٣) ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێ: لەشێوەی خوێندنەوەی پێغەمبەریان ﷺ پرسی: ئەویش وتی: (کانتْ قِرَاءَتُهُ مَدّا، ثم قرأ (بسم الله الرحمن الرحیم) يَمُدُّ بسم الله، ویمد الرحمن، ویمد الرحیم) بوخاریی. (٤) لەتەك فەرموودەیەکی تریش کەپێشەوا (ئەحمەد) هێناویەتی. دەستەیەکیش دەڵێن: بە دەنگی بەرز ناخوێندرێ، ئەمەش رای هەر چوار خەلیفەکەو، عەبدالله ی کوڕی موغەففەل و خەڵکێکی ترە لەپێشینان و پاشینان. لە فەرموودەیەکی (متفق علیە)یشدا کە (ئەنەس) دەڵێ: (صَلَّیتُ خَلْفَ النبیﷺ وأبی بکر وعمرَ وعثمانَ فکانوا یَسْتَفْتِحُونَ بالحمدلله رب العالمین). پێشەوا (موسلیم) یش ئەم ریوایەتەی دیکەی هێناوە: (لا یذکرون (بسم الله الرحمن الرحیم) فی أول قراءة، ولا فی آخرها) هەروەکو ئیمامی (بوخاریی)ش هێناویەتی لە (کتاب الآذان،١٨٩/١. ئەمەی باسکرا بەڵگەی ئەو کەسەیە کە لەنوێژدا (بسم الله..)ی بەدەنگی بەرز

دەخوێنێ، ئەوکەسەش کە بەهێواش بیخوێنێ، ئەوا نوێژەکەی هەردوولا دروستە، بەڵام خوێندنەوەی بە دەنگی نهێنی و هێواش لە رەوشتی پێغەمبەرو خەلیفەکانەوە نزیکترەو، فەرموودەی (متفق علیه)یشی لەسەرە.

## چەند زانیارییەکی پێویست:

* **سوورەت:** بەبەشێ لەقورئانی پیرۆز دەڵێن کەلەسێ ئایەت کەمتر نەبێ. شیاوی باسیشە گش قورئان (١١٤) سوورەتە، درێژترینی سوورەتی، سوورەتی (بەقەرە)یە، و کورتترین و بچوکترین سوورەتیشی، سوورەتی (کەوسەر)ـە، درێژترینی ئایەتیشی، ئایەتی (٢٨٦)ـی سوورەتی (بەقەرە)یە، وە کورترینی ئایەت، ئایەتی (مُدهامَّتانِ)ـی سوورەتی (الرحمان)ـە.

* **ئایەت:** بە واتای نیشانە هاتووە، ئایەتەکانی قورئانیش: (٦٢٠٠)و زیادەیە کە، لەنێوان (٤) تا(٤٠) ئایەت.

* **سوورەتی مەککەیی:** بەو بەشە قورئانە دەڵێن کەلە (مەککە)دا هاتووە، ئەوانیش(٨٣)سوورەتن، (مەدەنی)یش: ئەو بەشە قورئانەیە کە لە (مەینە)دا هاتووەتە خوارەوە، ئەمانیش (٨١) سوورەتن.

* سوورەتی (فاتیحە/٧)ئایەتە، ئیمامی شافیعیی (رەحمەتی خوای لێ بێت) (بسم الله..) بەیەکەم ئایەتی قورئان دادەنێ، بەڵام زانایانی دیکە (الحمدلله) بەیەکەم ئایەت دادەنێن و (بسم الله..) بەئایەت دانانێن، جا بەپێی ئەم بۆچوونە ئایەتی شەشەم: (صراط الذین..)ـەیە، ئایەتی حەوتەمیش: (غیر المغضوب علیهم ولاالضالین)ـە.

* هەرکەسێ ویستی بەشێ لەقورئان-سورەتێ، یاکەمتر- بخوێنێ سووننەتە لەسەرەتایەوە بڵێ: (أعوذبالله من الشیطان الرحیم)، ئاماژە بەو ئایەتە کەدەفەرموێ: (فإذا قرأت القرءان فاستعذ بالله من الشیطان الرجیم).

* سوننەتە بۆ خوێندنی هەربەشێکی قورئان، کەم یان زۆر- سوورەتی (تەوبە) نەبێ-(بسم الله الرحمن الرحیم)یش بکرێ، هەروەها بۆ هەر کارێکی تری خێرو باش و شەرعیی.

کۆتایی سوورەتی فاتیحە.

ولله الحمد والمنة.

*** *** ***

## ٢- سوورەتی ( بەقەرە ).

## مەدەنییەو ( ٢٨٦ ) ئایەتە.

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتە لەسوورەتە درێژەکانی قورئانەو، داکۆکیی لەسەر چەسپاندنی چەند ئەحکامێکی کۆمەڵایەتیی نێو موسڵمانان دەکات، پەنجە دەخاتە سەر پایە گرنگەکانی ئیمان و بیروباوەڕ، جۆرەکانی خواپەرستیی، مامەڵەو کڕین و فرۆشتن، ئەخلاق و رەوشت و قییەم، کاروباری خانەوادەو خێزان و ژن بەشوودان و مارەیی و تەڵاق و لەیەك جیابوونەوە، "عیدەوحەیزی ژنان" وچەندین حوکمی تر. جا لە سەرەتاوە هەندێ لە سیفاتی موسڵمانان وبێ باوەڕان و دووڕووەکان باس ئەکات، ئینجا سەرەتای دروستبوون وداستانی باوەگەورەمان ئادەم عليه السلام هەتا دەرچوو لە بەهەشت. ئەوسا بەدرێژە ئەڕواتە سەر باسی جوولەکە کە لەمەدینەدا دراوسێی موسڵمانەکان بوون، تەواوی پیلانەکانیان ئەخاتە ڕوو، وە هەر لەبەر خەیانەت وگزیکارییانە کە پتر یەك لەسەرسێی سوورەتەکە لەوان ئەدوێ، دیسانەوە چونکە موسڵمانەکان هێمان لەسەرەتای دروستکردنی دەوڵەتدا بوون، ئەگەڕێتەوە سەر دانانی چەند یاساو بەرنامەیەك بۆیان، بۆئەوەی لەخواپەرستیی و مامەڵەیاندا کاری پێبکەن، وەك باسی حوکمی ڕۆژوو و حەج و

جیهادو ناشیرین کردنی سوو(ریبا) لەناویاندا. ئەم سوورەتە لەبەر بایەخدان بەو ڕووداوە گەورەیەی لەسەردەمی (مووسا) پەیامبەردا ﷺ ڕوویدا، پێیدەڵێن: سوورەتی (بەقەرە) چونکە ئەودەمە جوولەکەیەك کوژراو بکوژەکەی نەدەزانرا..! ئینجا بۆ دۆزینەوەی بکوژەکە مەشۆرەتیان بەمووسا کرد، خوای کارجوانیش نیگای بۆ مووسا کرد کە: دەبێ مانگایەك سەربڕن و پارچەیەکی لە ئەندامێکی جەستەی کوژراوەکە بدەن، جابە فەرمانی خوا زیندوو دەبێتەوەو، ناوی بکوژەکە دیاریی دەکات. لەجێگای خۆیدا زیاتر ئەم باسە دێت. ئەم سوورەتە یەکێکە لەو (٢٩) سوورەتانەی کە سەرەتاکەیان بەپیتی پچڕ پچڕ لەیەك دەست پێدەکات، وەك: (ص، ق، ن، طه، یس، طس، حم، ألم، الر، طسم، المص، المر، کهیعص، حم، عسق). (ئیبن کەسیر) دەڵێت: پیتە دووبارە بووەکانیان لێدەرکە، ئەم (١٤) پیتەیان دەمێننەوە کەلەم وتەدا کۆ کراونەتەوەوکورتەکەی دەبێتە: (نَصٌّ حَكِيمٌ قَاطِعٌ لَهُ سِرٌّ). زاناکان لەدیارییکردنی مەبەست لەم پیتانەدا قسەی جیاوازیان هەیە، بەڵام قسەی ڕاستر ئەوەیە کە: ئەو پیتانە ئاماژەن بۆئەوەی کە قورئان موعجیزەیەو هیچ کەسێکیش ناتوانێ نموونەی تەنها سوورەتێکیشی لێ بێنێ. سەبارەت بە گەورەیی ومەزنی سوورەتی (بەقەرە) گەلێ فەرمووده هاتوون، کە ئەمانە بڕێکیانن: ((لاتَجْعَلُوا بُيُوتَكُمْ مَقَابِرَ، فإن الشيطان يَنْفُرُ من البيت الذى تُقْرَأُ فيه سورةُ البقرةِ)) (موسلیم، ترمزیی) واتە: نەکەن ماڵەکانتان وەك گۆڕستان لێبکەن، (کڕووکپ)ی لێبکەن و قورئانی تێدا نەخوێنن، بەتایبەتی سوورەتی (بەقەرە)، چونکە هەرماڵێك سوورەتی (بەقەرە)ی تیا بخوێنری" شەیتان بە پەلە لێی هەڵدێ و لەوجێگایەدا ناوەستێت.

* ((إقْرَأُوا سورةَ البقرةِ. فَإنَّ أخذَها بركةٌ، وتَرْكَها حَسْرَةٌ، ولا يستطيعها البَطَلَةُ)) (موسلیم). واتە: هەمیشە سوورەتی (بەقەرە) بخوێنن، چونکە خوێندنی ئەو سوورەتە، مایەی فەڕو پیتەو، واز لێهێنانیشی مایەی پەشیمانیی و داخ و حەسرەت و خەفەتە، وە هەرگیز جادووبازەکانیش دەرەقەتی ئەوجێگایە نایەن و پێی ناوێرن کە ئەوی تێدا خوێنراوە.

* پێغەمبەریش ﷺ کاتێ کەکۆمەڵێکی نارد بۆ ئەنجامدانی کارێك، ئەوکەسەیانی کردەسەرکردەو بەرپرسیان کە: سوورەتی (بەقەرە)ی لەبەربوو، پاشان پێیفەرموو: ((إذْهَبْ فأنتَ أميرُهُمْ)) ترمزیی، واتە:دەسابچۆو، تۆ رابەروئەمیریان بە.

## قورئان ڕێ نیشاندەری پارێزگارانە:

بەڵێ قورئانی پیرۆز ڕێنماو شفای دڵانە، بەڵام دڵانێك کە ئامادەبن بۆ بیستن و وەرگرتن، ئامادەبن کەڵك و سوود لەم قورئانە وەرگرن، وەك چۆن نەخۆشێك ئامادە دەبێ لەبەردەم پزیشکدا بۆ وەرگرتنی ئامۆژگارییەکانی و، بەکارهێنانی دەرمانەکانی، بۆیە دەفەرموێ: ﴿بسم الله الرحمن الرحيم * [١-٢] الم ذلك الكتاب لاريب فيه﴾ ئەم کتێبە (قورئان) بۆ کەسێك تێبفکرێ هیچ گومانێکی تێدا نییە کە لەلایەن خواوەهاتووە، بۆیە لە جێگایەکی تردا دەفەرموێ: (الم تنزيل الكتاب لاريب فيه من رب العالمين).

**ڕوونکردنەوەیەك:** (ذلك) لێرەدا لەجێی (هذا)دایە، جابۆیە (هذا)یش گۆڕدراوە بە(ذلك) هەتا گەورەیی و پایەو پلەی بڵندی قورئان دەرکەوێ، چونکە هەر وەکو لەزانستەکانی ڕەوان بێژیدا هاتووە: (ذلك) بۆ هەرشتێکی خاوەن پایەو پلەی بەرزی وەکو قورئان بەکار دێت، عەرەبە زمانەوانەکانیش دەڵێن: (ذا/ للقريب، و (ذاك/ للمتوسط، و (ذلك /للبعيد).

﴿هدى للمتقين﴾ نوورو ڕێنمایه بۆ موسڵمانه پارێزکاره‌کان، واته: بۆ ئه‌وانه‌ی فه‌رمان و بڕیاره‌کانی خوا جێبه‌جێ ده‌که‌ن و، له‌کاره ناپه‌سه‌ندو حه‌رامه‌کانیش خۆ وه‌دووره‌گرن، وه‌شفای دڵانیشه بۆ ئیمانداران، وه‌کو ده‌فه‌رموێ: (قل هو للذين آمنوا هدى وشفاء..) یان ده‌فه‌رموێ: (وننزل من القرآن ماهو شفاء ورحمة للمؤمنين).﴿[٣] الذين يؤمنون بالغيب﴾ ئه‌وانه‌ی بڕوایان به گشت نهێنیی‌و نادیاره‌کان هه‌یه، وه‌کو به‌هه‌شت و دۆزه‌خ و فریشته و زیندووبوونه‌وه..هتد ﴿ويقيمون الصلاة﴾ و به‌ڕاستیی وبه شێوه‌یه‌کی تێرو ته‌سه‌ل و گشت کات له‌کاتی خۆیدا نوێژه‌کانیان ده‌که‌ن.

تێبینی: له به‌رگرنگیی ومه‌زنی نوێژ، (٦٧) جار له‌قورئانی پیرۆزدا ناوی هاتووه.﴿ومما رزقناهم ينفقون﴾ وه له‌وه‌ش کردوومانه به‌رزق و رۆزییان له ڕێگای خێردا ده‌به‌خشن و زه‌کاتی لێده‌ده‌ن، له فه‌رمووده‌یه‌کی (متفق عليه)دا هاتووه‌و ده‌فه‌رموێ: ((بُنِـيَ الإسـلامُ علـى خَمْسٍ: شهادةِ أن لاإلـه إلا الله وأن محمدا رسول الله، وإقامِ الصلاةِ، وإيتاءِ الزكاة، وصومِ رمضان، وحَجِّ البَيْتِ)) واته: ئیسلام له سه‌رپێنج پایه دامه‌زراوه:



١- شایه‌تی به تاك وته‌نیایی خوای میهره‌بان و به پێغه‌مبه‌رێتی(موحه‌ممه‌د ﷺ).

٢- جێبه‌جێکردنی نوێژ به ڕێك وپێکی.

٣- زه‌کاتدان به‌و شێوه‌یه خوا ده‌یه‌وێ.

٤- رۆژووی مانگی ره‌مه‌زان.

٥- حه‌جی ماڵی خوا.

﴿[٤] والذين يؤمنون بما أنزل إليك﴾ وه‌ئه‌وانه‌ی بڕوایان به‌و قورئان و کتێبه‌هه‌یه بۆتۆ دابه‌زێنراوه ﴿وما أنزل من قبلك﴾ وه‌به‌و کتێب و نامه ئاسمانیانه‌ش که پێش تۆ بۆ پێغه‌مبه‌ران دابه‌زێنراون ،واته: ته‌ورات وئینجیل و(صحوف)ه‌کان. (ئه‌بووداود) ریوایه‌ت ده‌کاو ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ر ﷺ ده‌فه‌رموێ:((إذا حَدَّثَكُمْ أهلُ الكتابِ فلا تُكَذِّبوهم ولا تُصَدِّقُوهُمْ، ولكن قولوا: آمنا بالذى أنزل إلينا وأنزل إليكم)) واته: کاتێ خاوه‌ننامه‌کان ئاخافتن بۆتان، ئێوه(ئه‌ی ئیمانداران!) نه به‌درۆیان بخه‌نه‌وه‌و نه ته‌صدیقیشیان بکه‌ن، به‌ڵکو بڵێن:باوه‌ڕمان هێناوه به‌و نامه‌یه بۆ ئێمه‌و بۆ ئێوه دابه‌زێنراوه. ﴿وبالآخرة هم يوقنون﴾ وه بڕوای به‌هێزو یه‌قنیشیان به‌هاتنی ڕۆژی دوایی هه‌یه. ﴿أولئك على هدى من ربهم﴾ ئه‌وانه - خاوه‌نی ئه‌و پێنج سیفه‌تانه- له‌سه‌ر ئه‌وڕێگه‌و ڕێبازه‌ن له‌لایه‌ن په‌روه‌ردگاری خۆیانه‌وه ڕێنما کراون بۆی ﴿وأولئك هم المفلحون﴾ وه هه‌ر ئه‌وانه‌ش ڕزگارو سه‌رفرازن.

### خوا نەناس لە باوەڕ خۆی دەبوێرێ!:

لەئایەتەکانی پێشوودا هەندێ لەسیفاتی ئیمانداران باسکرد، ئێستاش بەدوو ئایەت باسێکی کورتی خوا نەناس و بێ باوەڕان دەکات، تاخەڵکی چاك و خراپ، بەختیارو کافرو کەللەڕەق بەباشی بناسرێن و لای هەموان ڕوون و ئاشکرا بن، بۆیە ئەفەرموێ:

﴿٦ إن الذين كفروا﴾ بێگومان ئەوانەش سەبارەت بە بەڵگەو ئایەتەکانی خوا ، خوانەناس و بێباوەڕن ﴿سواء عليهم﴾ وەك یەك وایە بۆیان ﴿أأنذرتهم ام لم تنذرهم﴾ ئایابیانترسێنی، یان نەیانترسێنی, واتە: ئاگاداریان بکەیت، یان نا ﴿لايؤمنون﴾ هەر باوەڕ ناهێنن، کەوابوو لەباوەڕنەهێنانیان دڵنیابەو بەتەمایان مەبەو خەریکی کاری خۆتبە

﴿٧ ختم الله على قلوبهم و على سمعهم﴾ چونکە خوا بەهۆی گوناح و سەرپێچیانەوە مۆری بەدبەختیی بەسەر دڵ و گوێیاندا ناوە، هەرگیز ڕۆشنایی بڕوایان تێناچێ و هەق نابیستن، بۆیە پێغەمبەر ﷺ گەلێ جار ئەم زیکرە لەسەرزاری بووو دەیفەرموو: ((یامُقَلِّبَ القلوبِ ثَبِّتْ قلوبَناعلى دينِك)) ترمزیی.

﴿وعلى ابصارهم غشاوة﴾ وە بەسەر چاویشیانەوە پەردەیەك هەیە، هەرگیز ڕێگای هەق و ڕاستیی نابینن ، چونکە لەئاستی ئەودا خۆیان کوێر کردووە، بۆیە ئەگەرچی بەچاو هەق ببینن. بەڵام بەدڵ وەریناگرن و دوای ناکەون ﴿ولهم عذاب عظيم﴾ هەر بۆیە سزایەکی زۆر مەزن و گەورەشیان بۆ هەیە .

#### ڕێنماییەکانی ئایەتی(٦-٧):

١) سوننەتی خوا وایە کە: ئەو کەسانەی ئەهلی عینادو ئێرەیی بن و خۆ بەزلزان و سوور بن لەسەرکوفرو بێ بڕوایی، لەهیدایەت و ڕینمایی بێبەشیان دەکا ، چونکە ئەوان لەئاست ڕیگاراستەکەی ئەودا خۆیان کەڕو کوێرولاڵ دەکەن و ڕێ دەرناکەن.

الجزء الأول　　سورة البقرة

إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ سَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ ءَأَنذَرۡتَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تُنذِرۡهُمۡ
لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٦﴾ خَتَمَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ وَعَلَىٰ سَمۡعِهِمۡۖ وَعَلَىٰٓ
أَبۡصَٰرِهِمۡ غِشَٰوَةٞۖ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿٧﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ
مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَمَا هُم بِمُؤۡمِنِينَ ﴿٨﴾
يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَمَا يَخۡدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡ
وَمَا يَشۡعُرُونَ ﴿٩﴾ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضٗاۖ
وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمُۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡذِبُونَ ﴿١٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ
لَا تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ قَالُوٓاْ إِنَّمَا نَحۡنُ مُصۡلِحُونَ ﴿١١﴾
أَلَآ إِنَّهُمۡ هُمُ ٱلۡمُفۡسِدُونَ وَلَٰكِن لَّا يَشۡعُرُونَ ﴿١٢﴾ وَإِذَا قِيلَ
لَهُمۡ ءَامِنُواْ كَمَآ ءَامَنَ ٱلنَّاسُ قَالُوٓاْ أَنُؤۡمِنُ كَمَآ ءَامَنَ ٱلسُّفَهَآءُۗ
أَلَآ إِنَّهُمۡ هُمُ ٱلسُّفَهَآءُ وَلَٰكِن لَّا يَعۡلَمُونَ ﴿١٣﴾ وَإِذَا لَقُواْ
ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوۡاْ إِلَىٰ شَيَٰطِينِهِمۡ قَالُوٓاْ إِنَّا
مَعَكُمۡ إِنَّمَا نَحۡنُ مُسۡتَهۡزِءُونَ ﴿١٤﴾ ٱللَّهُ يَسۡتَهۡزِئُ بِهِمۡ وَيَمُدُّهُمۡ
فِي طُغۡيَٰنِهِمۡ يَعۡمَهُونَ ﴿١٥﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشۡتَرَوُاْ ٱلضَّلَٰلَةَ
بِٱلۡهُدَىٰ فَمَا رَبِحَت تِّجَٰرَتُهُمۡ وَمَا كَانُواْ مُهۡتَدِينَ ﴿١٦﴾

٣

٢) وشیاریی و وریایی لەسووربوون و پێداگرتن لەسەر کوفرو ستەم و فەساد، بۆ دواییش تووڕە بوونی خواو ناردنی سزاو قار لێگرتن.

### دوو ڕووەکان بناسە!

جا دوای باسی هەندێ لە نیشانەو سیفاتی باوەڕدار و بێ باوەڕان، دێت لە (١٠) ئایەتدا باسی نیشانەی دوو ڕووەکان دەکا، هەتا ئاشکرابێ کە ترسناکی ئەوانە زۆر گەورەترو خراپترە لەمەترسی لە خوانەناس و بێ بڕوایان ، بۆیە دەفەرموێ: ﴿٨ ومن الناس من يقول آمنا بالله وباليوم الآخر﴾ لەو خەڵکانەدا کەسانێك هەن دەڵێن: باوەڕمان بەخواو بەڕۆژی دوایی هەیە ﴿وما هم بمؤمنين﴾ کەچی درۆ دەکەن و، لەراستییدا بڕوایان نییە، بەڵکو دەیانەوێ

ئێوە فریو بدەن و، وردە وردە لێتان نزیك ببنەوەو، لە دژتان پیلان بگێڕن و، پشێوی بخەنە ناوتانەوەو ریزەکانتان تێك بدەن، بۆیە دەفەرموێ: ﴿٩ یخادعون الله والذین آمنوا﴾ ئەوانە بەنیازی خۆیان دەیانەوێ فێڵ و تەڵەکە لەگەڵ خوداو ئەوکەسانەدا بکەن کە بڕوایان هێناوە ﴿وما یخدعون إلا انفسهم﴾ بەڵام لەڕاستییدا تەنها لەگەڵ خۆیان فێڵ وفەرەج ئەکەن و زیانەکەشی هەر بۆ خۆیان ئەگەڕێتەوەو تەنها خۆیان دەخەڵەتێنن ﴿وما یشعرون﴾ لە حاڵێکدا هەستیش بەو راستییە ناکەن! دیارەهۆی بێ هەستیشیان هەر ئەمەیە کە: ﴿١٠ فی قلوبهم مرض﴾ دڵیان دەردو نەخۆشیی و حەسوودیی‌و گومان و ناپاکیی تێدایە ﴿فزادهم الله مرضا﴾ جاخوایش ڕۆژ لەدوای ڕۆژ دەردو نەخۆشییەکەیانی زیاد کردن، جگە لەوەیش ﴿ولهم عذاب الیم﴾ سزایەکی سەخت و ئێش پێکەیەنەریان بۆهەیە ﴿بما کانوا یکذبون﴾ لەبەر ئەوە کەدرۆیان کرد، بەتایبەت ئەو دەمەی کە دەیانگوت بڕوامان بەخواو بەڕۆژی دوایی هەیە.

رێنمایی ئایەتەکانی (١٠،٩،٨):

١- خۆپاراستن لەدرۆوکاری دووڕوویی و فرت وفێڵ، دیارە کە ئەنجامی ئەو کارانەش هەر لەسەر خاوەنەکەی دەشکێتەوە.

٢- (منافیق) و دووڕوو کەسانێکن کە بەزمان ئیمان ئاشکرا دەکەن و، کوفرو بێ بڕوایی لەدڵ و دەروونیاندا دەشارنەوە.

(ئیبن عەباس) -خوای لێ ڕازی بێ - دەڵێ: دوو ڕووەکانی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ (٣٥٠) پیاوو (١٧٠) ژن بوون، ئەوانیش پێکهاتبوون لە کەسانێکی هۆزی (ئەوس) و (خەزرەج) و جوولەکە، هاوڕێ لەگەڵ سەرۆکی دووڕووە موشریکەکانیش: (عەبدوڵڵای کوڕی سەلوول). ﴿١١ وإذا قیل لهم لاتفسدوا فی الأرض﴾ وەکاتێ پێیان بگوترێ: گێرە شێوێنی و ئاشووب و خراپەکاری لەم وڵات و زەویەدا مەکەن ﴿قالوا إنما نحن مصلحون﴾ دەڵێن: هەرگیز ئێمە گێرە شێوێن و ئاژاوەچی نین، بەڵکو ئێمە هەرچاکسازو ڕێکخەری کاری چاك و باش بووینە ! بۆیە خوای گەورە لەم ئایەتەی دواییەدا بەدرۆیان دەخاتەوەو دەفەرموێ: ﴿١٢ الا إنهم هم المفسدون﴾ وشیاربن ! کە بە راستی هەر ئەوانن موفسید و خراپەکارو گێرەشێوێن ﴿ولکن لایشعرون﴾ بەڵام بەهۆی لووت بەرزییانەوە بەخۆیان نازانن و هەستیش ناکەن کە ئەنجامی ئەو درۆیانە هەر دەرئەکەوێ ! ﴿١٣ وإذا قیل لهم آمنوا کما آمن الناس﴾ وە کاتێ پێیان بگوترێ: دەسا ئێوەش وەکو ئەو مەردمە ئیمانداره، ئیمان و باوەڕێکی ڕاستەقینە بێنن ﴿قالوا انؤمن کما آمن السفهاء﴾ دەڵێن: جائایا ئێمەش وەك ئەو خەڵکە گێل و نەفامانە، (واتە: وەك سووهەیب و بیلال و عەممار) بڕوا بێنین؟! گوایە: ئەوانە ئەرنەفام و گێلە پیاو نەبوونایە، باوەڕیان نەدەهێنا...!

ئینجا خوای گەورەش وتەکەیان ڕەت دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿الا إنهم هم السفهاء ولکن لایعلمون﴾ خەڵکینە چاك بزانن! کە ئەوانن گێل و نەفامی‌ڕاستەقینە، بەڵام بەخۆیان نازانن.

ڕێنماییەکانی ئایەتی (١١-١٣):

١- لوتبەرزیی و خۆهەڵکێشانی نابەجێ و ناهەق، لەسیفەتی دووڕووانە، بێگومانیش کارێکی نامرۆڤانەو ناجوامێرانەشە.

٢- ئیسلاح و چاکسازی لەوڵاتدا هەر بە گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەری ئەو دەبن.

٣- فەسادو وێرانکاریش بە نافەرمانی و یاخیبوون لەخواو، لەپێغەمبەری خوا دەبێ.

٤- خراپەکاران هەمیشە خراپەو فەسادەکەیان بەئیسلاح و چاکسازی دادەنێن!.

**فێڵ و فەرەجی دووڕووەکان:**

لەم ئایەتانەی خوارەوەدا هەندێ لە کاروکرداری دووڕازییەکان دەخاتەروو، بۆ ئەوە موسڵمانان وشیاربینەوە و بە زمانی لووسیان نەخەڵەتێن، دەفەرموێ:﴿[١٤] وإذا لقوا الذين آمنوا قالوا آمنا﴾ وە ئەو دووڕووانە کاتێ تووشی ئەوانە ئەبن باوەڕیان هێناوە، بۆ فریودانی ئیمانداران ئەڵێن: ئێمەش وەك ئێوە باوەڕمان هێناوەو موسڵمانین!! ﴿وإذا خلوا إلى شياطينهم﴾ وەکاتێکیش دەگەنە لای فەرماندە شەیاتینەکانیان ﴿قالوا إنا معكم إنما نحن مستهزئون﴾ دەڵێن: لەراستییدا ئێمە لەگەڵ بەرنامەوبیروباوەڕی ئێوەداین، ئێمە هەر گاڵتەیان پێدەکەین، ئەگینا چۆن دەچینە سەر بیرو باوەڕی ئەو گێل و نەفامانە ؟! ﴿[١٥] الله يستهزئ بهم﴾ با ئەوانە هەرقسەبکەن، بەراستیی خوای باڵادەست گاڵتە بەوان دەکات ﴿ويمدهم في طغيانهم يعمهون﴾ و یەك دوو رۆژێ مۆڵەتیان دەدات، تا پترخۆیان بەدبەخت بکەن و، لە سەرکێشی ولاڕێیی خۆیاندا سەرگەردان بن ﴿[١٦] أولئك الذين اشتروا الضلالة بالهدى﴾ ئەو ناپاکانەن هیدایەت و ڕێنوێنیان بە ڕێبازی چەوت وگومڕایی فرۆشت و، ڕێبازی راست و دروستیان دۆڕاند ﴿فما ربحت تجارتهم﴾ جائەو سەوداو بازرگانییەیان سوودبەخش نەبوو، قازانجیان لێ نەکرد ﴿وما كانوا مهتدين﴾ وە ڕێگەی بەختیاریی و هیدایەتییان دەست نەکەوت.

ڕێنماییەکانی ئایەتی (١٤-١٦):

١- دژواریی کاروکردەی دووڕووەکان.

٢- وشیاریی لە نزیکبوونەوە لەوانەی کەلەگەڵ کەسێکدا ڕوویەکیان هەیەو، لەگەڵ کەسێکی تردا ڕوویەکی تر، وەك لە فەرموودەیەکی (متفق علیە)شدا هاتووەو دەفەرموێ: ((شِرَارُكُمْ ذُو الوَجْهَيْنِ)) واتە: زۆر خراپەکانتان دووڕووەکانتانن .یان دەفەرموێ: ((.. و تَجِدُونَ شَرَّ الناس ذا الوَجْهَيْنِ، الذي يأتي هؤلاءِ بوَجْهٍ، وهؤلاءِ بوجهٍ)). واتە: دووڕووەکانت بە خراپترین کەسی کۆمەڵگەت دەست دەکەون.

٣- هەندێ مرۆڤی وەك شەیتان هەن کە هەمیشە کاروپیشەیان بانگکردنی خەڵکییە بۆ ڕێبازی چەوتی کوفرو نافەرمانی خوا.

٤- تۆڵەو سزا بۆدوژمنانی دین، لای خوا براوەتەوەو مسۆگەرە.

**دوو نەزیلەو نموونە بۆ دووڕووەکان:**

ئەم قورئانە پیرۆزە لەسەر باوونەریتی عەرەبەکان هاتووە، بەتایبەت بۆنموونە هێنانەوەو(تەشبیە)کردن، بۆیە لێرەدا دووجۆرە نموونەیان بۆ دەهێنێتەوەو هەر یەکەیان (تەشبیە) دەکات بەحاڵ و بارودۆخێکەوە، بۆیەکەمیان دەفەرموێ: ﴿[١٧] مثلهم كمثل الذي استوقد نارا﴾ نموونەی ئەودووڕووەناپاکانە، وەك مەسەلەی کەسێکە، کە بۆ خۆی خەریکی هەڵگیرساندنی ئاگرێك بێت، تا ڕێی‌پێدەربکات﴿فلما أضاءت ما حوله﴾ هەرکە ئاگرەکە هەڵگیرسا و دەوروبەری ڕووناککردەوە ﴿ذهب الله بنورهم﴾ خوا ڕووناکییەکەی بردن و کوژاندیەوە ﴿وتركهم في ظلمات لا يبصرون﴾ لەناو تاریکستاندا، وێڵی کردن وهێشتنیەوە، دیارە ئیتر بەهیچ کلۆجێ نابینن و ڕێی هەقیانەت دەرناکەن ﴿[١٨] صم بكم عمي فهم لايرجعون﴾ ئەوانە چونکە هەق نابیسن و وشەی راست بەزا باندا نایەو، لەهەقیش ترووسکایی ناکەن ، کەڕولاڵ وکوێرن، ئیتر پەشیمانیش نابنەوەوناشتوانن بگەڕێنەوە بۆهەق و ڕاستیی. بەڵێ یەکەمجار ئەو دووڕووانە بۆ ترووسکاییەك تاریی پیدەرکەن زۆر هەوڵیاندا، بۆیە هەرکە ئیسلام هات قۆزتیانەوەو

خه‌ریكبوو له‌تاریكستان خۆ رزگاربكه‌ن، به‌ڵام پاش ئه‌وه به‌په‌له پاشگه‌ز بوونه‌وه‌و، باوونه‌ریتی باووباپیرانیان تینی تیكردنه‌وه‌و پشتیان له‌ئیسلام هه‌ڵكرده‌وه‌و كه‌وتنه‌وه ناوشه‌وه زه‌نگه‌كه‌وه، هه‌ر وه‌ك ئه‌و كه‌سه كه ئاگره‌كه‌ی كرده‌وه‌و پاشان لێیكوژایه‌وه. ئینجا بۆ مه‌سه‌ل و نموونه‌ی دووه‌میشیان ئه‌فه‌رمویٚ: ﴿[١٩] أو كصيب من السماء فيه ظلمات﴾ یان وه‌ك كه‌سانێك وان كه له جێگایه‌كی زۆرتاریكدا، بارانێكی به‌خوڕه‌م و لێزمه‌یان لیٚ بباریٚ ﴿ورعد وبرق﴾ و تریشقه‌و شریخه‌ی هه‌وره برووسكه‌و چه‌خماخه سه‌ریان لیٚ تێكبدا ﴿يجعلون أصابعهم فی آذانهم من الصواعق حذر الموت﴾ ئه‌وانیش له‌ترسی مردن و ئه‌وده‌نگه قورس وسه‌خته‌دا پل وقامكیان بئاخننه ناو گوێچكه‌یان ﴿والله محيط بالكافرين﴾ هه‌رچه‌ند كاری واش بكه‌ن، هه‌رگیز له‌مردن رزگار نابن، چونكه خوا چوار ده‌وره‌ی خوانه ناس و بیٚ باوه‌ڕانی داوه‌و، زاڵه به‌سه‌ریاناو، قه‌ت له‌ده‌ستی ده‌رناچن ﴿[٢٠] يكاد البرق يخطف أبصارهم﴾ نزیكه ئه‌و به‌رق و چه‌خماخه‌یه، چاویان له‌جێی خۆی بفڕێنیٚ و كوێر ببن ﴿كلما أضاء لهم مشوا فيه﴾ هه‌ركه ئه‌و به‌رق و بزیسكه‌یه رێگه‌یان بۆ روونا كردنه‌وه، ئه‌وان له‌به‌ر رووناكاكییه‌كه‌یدا ده‌كه‌ونه ڕیٚ ﴿وإذا أظلم عليهم قاموا﴾ كه رووناكییه‌ش كوژایه‌وه‌و نه‌ماو تاریك بوولێیان، راده‌وه‌ستن و هه‌ڵوێسته ده‌كه‌ن ﴿ولو شاء الله لذهب بسمعهم وأبصارهم﴾ خۆ ئه‌گه‌ر خوا ویستبای هێزی بیستن و بینایی له‌كارده‌خستن ﴿إن الله على كل شئ قدير﴾ بێگومان خوا به‌سه‌ر هه‌موو شتێكدا ده‌سه‌ڵاتی هه‌یه‌و به‌ توانایه. لەم ئایه‌تانه‌دا خوا دووڕووه‌كان به‌رامبه‌ر به قورئان ده‌چوێنێت به‌چه‌ند كه‌سێك كه له شه‌وێكی باراناوی و تاریكستاندا بزیسكه‌و چه‌خماخه لێیان بداو، له‌وكاته‌دا فرسه‌تی لیٚ بێنن و چه‌ند هه‌نگاوێك بچن، به‌ڵام كه رووناكییه‌كه نه‌ماو كوژایه‌وه، خێرا له‌سه‌رپیٚ بووه‌ستن..! چونكه ئه‌مانیش هه‌ركه قورئان به پێی ئاواته‌كانی ئه‌وان بووبا، هه‌نگاوێكیان ده‌ناو به‌ره‌و پێش ده‌هاتن و، به دڵیان بوو.. خۆئه‌گه‌ر پێچه‌وانه‌ی خواست و ئاره‌زووه‌كانی ئه‌وان بووایه، وه‌ك ئه‌وه كه فه‌رمان بدابه جیهادو به‌خشینی ماڵ و سامان له‌ڕێی‌خوا –ئه‌وا تێیدا ده‌وه‌ستان و پاشه‌وپاش ده‌گه‌ڕانه‌وه، وه‌كو له‌جێگایه‌كی تردا باسی سروشتیان ده‌كاو ده‌فه‌رمویٚ: (وإذا دعوا إلى الله ورسوله ليحكم بينهم إذا فريق منهم معرضون، وإن يكن لهم الحق يأتوا إليه مذعنين) نوور: ٤٨-٤٩.

الجزء الأول — سورة البقرة

مَثَلُهُمْ كَمَثَلِ ٱلَّذِى ٱسْتَوْقَدَ نَارًا فَلَمَّآ أَضَآءَتْ مَا حَوْلَهُۥ ذَهَبَ ٱللَّهُ بِنُورِهِمْ وَتَرَكَهُمْ فِى ظُلُمَٰتٍ لَّا يُبْصِرُونَ ﴿١٧﴾ صُمٌّۢ بُكْمٌ عُمْىٌ فَهُمْ لَا يَرْجِعُونَ ﴿١٨﴾ أَوْ كَصَيِّبٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فِيهِ ظُلُمَٰتٌ وَرَعْدٌ وَبَرْقٌ يَجْعَلُونَ أَصَٰبِعَهُمْ فِىٓ ءَاذَانِهِم مِّنَ ٱلصَّوَٰعِقِ حَذَرَ ٱلْمَوْتِ ۚ وَٱللَّهُ مُحِيطٌۢ بِٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٩﴾ يَكَادُ ٱلْبَرْقُ يَخْطَفُ أَبْصَٰرَهُمْ ۖ كُلَّمَآ أَضَآءَ لَهُم مَّشَوْا۟ فِيهِ وَإِذَآ أَظْلَمَ عَلَيْهِمْ قَامُوا۟ ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَذَهَبَ بِسَمْعِهِمْ وَأَبْصَٰرِهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٠﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعْبُدُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿٢١﴾ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ فِرَٰشًا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزْقًا لَّكُمْ ۖ فَلَا تَجْعَلُوا۟ لِلَّهِ أَندَادًا وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٢٢﴾ وَإِن كُنتُمْ فِى رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا فَأْتُوا۟ بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِۦ وَٱدْعُوا۟ شُهَدَآءَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٢٣﴾ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا۟ وَلَن تَفْعَلُوا۟ فَٱتَّقُوا۟ ٱلنَّارَ ٱلَّتِى وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلْحِجَارَةُ ۖ أُعِدَّتْ لِلْكَٰفِرِينَ ﴿٢٤﴾

٤ — وبشر الذين

**یه‌كتاپه‌رستیی (توحيد الألوهية) :**

پاش باسكردنی هه‌رسیٚ ده‌سته‌كه: (باوه‌ڕدارو، بیٚ باوه‌ڕو، دووڕوو) ئیتر سه‌رجه‌م مه‌ردم بانگ ده‌كات بۆ یه‌كتاپه‌رستیی و ڕوو له‌خواكردن، ده‌فه‌رمویٚ: ﴿[٢١] يا أيها الناس اعبدوا ربكم﴾ ئه‌ی خه‌ڵكینه! ته‌نها په‌روه‌ردگاری خۆتان بپه‌رستن ﴿الذی خلقكم والذين من قبلكم﴾ كه ئێوه‌و پێشووه‌كانی ئێوه‌ی له‌نه‌بوون دروستكردووه ﴿لعلكم

تتقون﴾ چونكە ئاوا پەرستنێك هێزی پارێزگاری دروست دەكاو، بەڵكو ئێوەش خۆ بپارێزن ﴿[٢٢] الذی جعل لكم الأرض فراشا﴾ خوایەكی وایە زەوی بۆ ئامادەكردوون و كردوویەتی بە رایەخ تا بەئاسانی لە سەری بژین ﴿والسماء بناء﴾ و بەلای سەرووشتانەوە -وەك گومەزیی و كۆشك- ئاسمانی راگرتووە ﴿وانزل من السماء ماء﴾ لەو حەوایشەوە ئاوێكی بۆ باراندن ﴿فأخرج به من الثمرات رزقا لكم﴾ ئینجا بەو بارانە جۆرەها میوەو رۆزی بۆ فەراهەم هێنان وشینی كرد ﴿فلا تجعلوا لله اندادا﴾ جاكەوابوو ئێوەش چاك بیپەرستن و، هیچ جۆرە هاوبەشێكی بۆدامەنێن و، تەنها یاساو بەرنامەكەی ئەو وەرگرن ﴿وانتم تعلمون﴾ دەخۆ خۆیشتان چاك دەزانن كە ئەوجۆرە بتانە هیچیان بەدەست نیەو، تەنها خوای گەورەیە رۆزیی و دارایی و سامانتان دەداتیّ، لەفەرموودەیەكی (متفق علیه)دا هاتووە: گەورەترین گوناح و تاوان لای خوا، قایەلبوونە بەشەریك بۆی، لە حاڵێكدا هەرئەویش دروستی كردویت، وە لە فەرموودەیەكی تردا هاتووە: مافی خوایە بەسەر بەندەكانیەوە كە: دەبیّ بەباشی بیپەرستن و هیچ شتیّ نەكەنە شەریك و هاوتای، وەكو ئەم فەرمووده دەفەرمویّ: ((لايقولَنَّ احَدُكُم ماشاءَالله وشاءَ فلانٌ، ولكن لِيَقُلْ: ماشاءالله ثم شاء فلانٌ)) پێشەوا ئەحمەد. واتە: هیچكامێكتان نەڵێن: ئەگەر خواو فلانەكەس، حەزو مەیلیان هەبیّ، بەڵكو دەبیّ بڵێت: خوا مەیلی هەبیّ، پاشان بڵیّ: فلانەكەسیش حەزی هەبێت.

**ئاماژەو رێنمایەكانی ئایەتی (٢١-٢٢):**

١- پەرستنی ئەو خوایە -كە خولقێنەری ئەم ژیانەیە-، واجیب و پێویستە.

٢- ناسینی خوا بە(ئەسماو سیفات)ەكانیەوە واجبە.

٣- شیرك و هاوبەشدانان -بە هەموو جۆرەكانیەوە- قەدەغەوحەرامە.

٤- چەسپاندنی پەیامەكەی پێغەمبەر ﷺ.

٥- ئادەمزاد سەبارەت بەقورئان سیّ دەستەو تاقمن: پارێزگاران و شوێنكەوتووی هەق. كەللە رەق و حاشاكەر لە هەق و راستیی. دوودڵ و بەگومان و بیّ بار.

### چەسپاندنی پەیامەكەی پێغەمبەر ﷺ :

پاش ئەوە لەئایەتەكانی پێشوودا یەكتاپەرستیی خوای كارزانی چەسپاند، ئیستا لەم ئایەتانەشدا، راستی قورئان و پێغەمبەرێتی موحەممەد ﷺ دەسەلمێنیّ ودەفەرمویّ: ﴿[٢٣] وإن كنتم فی ریب مما نزلنا علی عبدنا فأتوا بسورة من مثله﴾ ئەگەر سەبارەت بەو قورئانەی ئێمە ناردوومانەتە سەر بەندەی خۆمان موحەممەد ﷺ ئێوە دوودڵ و بەگومانن: ئاخۆ راستە یان نا؟ سا دەی هەوڵ بدەن هیچ نەبیّ بچووكترین سوورەتێك وەك ئەو بێنن ﴿وادعوا شهداءكم من دون الله﴾ بۆ ئەوەش شایەدو هاوباوەڕەكانتان، ئەوانەی وا لەكاتی تەنگانەدا پەنایان پیدەبەن -بێجگە لەخوا- بانگ بكەن﴿إن كنتم صادقین﴾ ئەگەر ئێوە راست دەكەن كە دەڵێن موحەممەد خۆی هەڵیبەستووە، خۆ ئێوەیش خۆشخوان و رەوانبێژن دەسا فەرموون وەك كورترتین سورەتی بێنن ﴿[٢٤] فإن لم تفعلوا ولن تفعلوا﴾ خۆ ئەگەر هیچتان بۆ نەكرا، كە هەرگیز هیچیشتان بۆ ناكریّ ﴿فاتقوا النار التی وقودها الناس و الحجارة﴾ دەسا وەرن باوەڕ بێنن وخۆتان بپارێزن لەو ئاگرەی كە دەستەچیلەو هەڵگیرسێنەرەكەی جەستەی ئادەمیی و بەردە، ددان بەوەیشدا بنێن كە ئەم قورئانە لەلایەن خواوەیە، ئەگینا دەبنە سووتەمەنی ئەوئاگرەی ﴿اعدت للكافرین﴾ كە ئێستا بۆكافران و بیّ باوەران ئامادەكراوە.

**ڕێنمایەکانی ئایەتی (٢٣-٢٤):**

١- هاتنی قورئان، بەڵگەیە لەسەر پێغەمبەرێتی موحەممەد ﷺ.

٢- دەسەوسان وەستان و، ناتەوانایی ئادەمیی بەرامبەر بەهێنانی تەنها سوورەتێ لەقورئان.

٣- تەنها بەباوەڕو کاری چاك ئادەمزاد لە ئاگر دوور دەکەوێتەوە.

## پاداشی موسڵمانە صاڵحەکان :

پاش ئەوەی سزای خوانەناسانی بەیانکرد، دێتە سەر باسی پاداشی ئیمانداران و دەفەرموێ: ﴿[٢٥] وبشر الذين آمنوا وعملوا الصالحات﴾ ئەی پێغەمبەر ﷺ! مژدە بدە بەوانەی کە بڕوایان بەخواو بەپەیامبەرو بە ڕۆژی دوایی هەیەو، ئاکارەچاك و پەسەندەکان ئەنجام دەدەن ﴿ان لهم جنات تجری من تحتها الأنهار﴾ کە بێگومان بەهەشت گەلێکیان بۆ هەیە، کەچەندین کانیاوو رووبار لەژێر دەرختەکانییدا دێن ودەچن ﴿کلما رزقوا منها من ثمرة رزقا﴾ هەر کە لەو بەرهەم و میوەی بەهشتانەیان بۆدێنن ودەیچێژن ﴿قالوا هذا الذی رزقنا من قبل﴾ دەڵێن: خۆهەر ئێستا لە مەتان بۆهێنان، ئەمە هەرئەو ڕۆزییە بوو کەپێشتر پێماندرا ﴿واتوا به متشابها﴾ دیارە ئەو میوەجاتەی لەبەهەشتا بۆیان دەهێنرێ، هەموو -لە چاکی و باشییدا بەرەنگ- لەیەك دەچن، بەڵام بە تام ومەزە لێك جیاوازن. (ئیبن ئەبی حاتەم) ئەم فەرموودەیە دێنێ: ((أنهارُ الجنة تَفجَّرُ تحت تِلالٍ، أو من تحت جبال المِسْكِ)) واتە: رووبارەکانی بەهەشت لە بن چەند گردو تەپۆڵکەیەك، یان لە ژێر چیای(میسك)ـەوە هەڵدەقوڵێن ﴿ولهم فيها ازواج مطهرة﴾ لەو بەهەشتەدا چەندین ئافرەت وهاوسەری پاك وخاوێنیان بۆ ئامادە کراوە ﴿وهم فيها خالدون﴾ وبە هەتا هەتاییش لەوێ ئەمێننەوەو ژیانێکی خۆش دەبەنە سەر.

الجزء الأول — سورة البقرة

وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ
تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ كُلَّمَا رُزِقُواْ مِنْهَا مِن ثَمَرَةٍ
رِّزْقًا قَالُواْ هَٰذَا ٱلَّذِي رُزِقْنَا مِن قَبْلُ وَأُتُواْ بِهِۦ مُتَشَٰبِهًا
وَلَهُمْ فِيهَآ أَزْوَٰجٌ مُّطَهَّرَةٌ وَهُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٥﴾
إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَسْتَحْيِۦٓ أَن يَضْرِبَ مَثَلًا مَّا بَعُوضَةً فَمَا
فَوْقَهَا فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن
رَّبِّهِمْ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَيَقُولُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ
بِهَٰذَا مَثَلًا يُضِلُّ بِهِۦ كَثِيرًا وَيَهْدِي بِهِۦ كَثِيرًا
وَمَا يُضِلُّ بِهِۦٓ إِلَّا ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٢٦﴾ ٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهْدَ
ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مِيثَٰقِهِۦ وَيَقْطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ
وَيُفْسِدُونَ فِي ٱلْأَرْضِ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿٢٧﴾
كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِٱللَّهِ وَكُنتُمْ أَمْوَٰتًا فَأَحْيَٰكُمْ
ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢٨﴾ هُوَ
ٱلَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى
ٱلسَّمَآءِ فَسَوَّىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴿٢٩﴾

٥

## خوا لە هێنانەوەی نەزیلە شەرم ناکات:

ئەوە بوو لە چەند ئایەتی پێشوودا رووبەرووی بێ بڕوایان وەستایەوەو پێیگوتن: ئەگەر ئێوە دەڵێن موحەممەد ﷺ بۆ خۆی قورئانی هەڵبەستووە، دەسا فەرموون ئێوەش وەك ئەوقورئانێك بێنن، ئەوانیش پەکیانکەوت وپێیان نەکرا وەکو تەنها سوورەتێکی کورتیشی بێنن، جا دیسانەوە رەخنەیەکی تر دەگرن ودەڵێن: ناوی هەندێ شت وەك: (هەنگمێش، جاڵجاڵۆکە، مێرووله) لەقورئانداهاتووە ئەگەر قورئان- وەك ئەوان دەڵێن فەرموودەی خوایە- هەق نەبوو باسی ئەوشتانەی تێدابوایە!! بۆیە دەفەرموێ: ﴿[٢٦] إن الله لايستحى ان يضرب مثلا ما بعوضة فما فوقها﴾ بێگومان خوا لەوەکە مەسەل ونموونە بە (مێشووله) و بچوکتریش لەو، یان گەورەتر لەو بهێنێتەوە شەرم ناکا، چونکە مەبەست لەونموونە هێنانەوە تێگەیاندنی خەڵکە، جا سەبارەت بەم مەسەل ونەزیلانە

مەردم دەبنە دوو بەشەوە، بەشێکی باوەڕی پێدەکەن ، وەکو دەفەرموێ:﴿فأما الذين آمنوا فيعلمون أنه الحق من ربهم﴾ ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە، چاك دەزانن ئەوجۆرە نموونانە هەقیقەتێکەو لەلایەن پەروەردگاریانەوەیە، واتە:هەرچۆنێ پەروەردگاریان بەهەق دەزانن، هەروا نموونەکانیشی بەهەق وراست دەزانن و بڕوایان پێدەکەن، بەشی دووەمیش: کەسانی خوا نەناس و بێباوەڕن و،هەردەم حاشا لەراستیی دەکەن، وەك دەفەرموێ: ﴿وأما الذين كفروا فيقولون ماذا أراد الله بهذا مثلا﴾ ئەوانەشیان کە کافرو بێ بڕوان دەڵێن: دەبێ مەبەستی خوا لەم نموونە هێناوەداچی بێ، واباسی ئەوجۆرە شتانە دەکات؟!! واتە:ئەگەر قورئان فەرموودەی خوا بوایە" باسی ئەوانەی تیا نەدەبوو!خوای گەورەیش لەوەڵامیاندا دەفەرموێ: ﴿يضل به كثيرا ويهدى به كثيرا﴾خوا بەومەسەلانە گەلێ کەس –لەبەر لاساریی خۆیان– گومڕاو سەر لێشێواودەکات،وە فرە کەسیشی –لەبەر ئامادەیی خۆیان بۆ هەق وەرگرتن– پێ شارەزاو ڕێنمایی دەکاو، دەرەنجام بەهەق دەگەن ﴿وما يضل به إلا الفاسقين﴾ خۆ ئاشکرایشە هەر ئەوکەسانەی پێگومڕا دەکا،کە خۆیان لاڕێ بن و لەسنوور دەرچووبن ﴿[٢٧] الذين ينقضون عهد الله من بعد ميثاقه﴾ لە سنوور دەرچووانیش ئەوانەن کە:پەیمان و بەڵێننامەی خوا –دوای تێگەیشتن و مەحکەم گرێدانی– هەڵ دەوەشێنێنەوە، واتە:لەسەرەتاوە بڕوای پتەویان بەهاتنی پەیامبەرمان (موحەممەد) ﷺ هەبووو چوونە ژێر فەرمانیەوە، کەچی دواتر لێی پەشیمان بوونەوەوهەڵیان وەشاندەوە ﴿ويقطعون ما أمر الله به أن يوصل﴾ وهەر پەیوەندییەکیش کەخوای گەورە فەرمانیدابوو دەبێ جێبەجێ بکرێت – وەك دۆستایەتی کردن لەگەڵ بڕواداران و گوێرایەڵی پەیامبەران و سەردانی خزمان–ئەوان پشتگوێی دەخەن و دەیبڕن، وەکو لە سوورەتی (قیتال)یشدا ئەم ئایەتە هاتووەو دەفەرموێ: (فهل عسيتم إن توليتم أن تفسدوا فى الأرض وتقطعوا أرحامكم). ﴿ويفسدون فى الأرض﴾ وەلە زەوییشدا فەساد بڵاو دەکەنەوەو، کاری بەدکاریی و ناجوامێریی دەکەن ﴿أولئك هم الخاسرون﴾ تەنها خاوەنی ئەم کارە ناپەسەندانە زیانمەندی ڕاستیی هەردووجیهانن. دوای ئەوەکە بە توندی دابەزییە سەر ئەوانەی کە بڕوایان بە مەسەل ونموونەکانی خواو پەیامبەر نیە، ئینجا بە شێوەیەکی زۆر بێزاریی و ڕەتکردنەوە پێیان دەفەرموێ: ﴿[٢٨] كيف تكفرون بالله﴾ خەڵکینە! ئێوەچۆن سەبارەت بە خوای گەورەکافرو بێ باوەڕ دەبن ؟ ﴿وكنتم أمواتا﴾ خۆئێوە پێش ئەم ژیانەتان بێ گیان ومردووبوون و،هەر لەتۆڵی خاك دا بوون ﴿فأحياكم﴾ ئینجا خوا گیانی بەبەرداکردن و هێنانیە خانەی هەبووەکانەوە ﴿ثم يميتكم﴾ دوای ئەوە بە ماوەیەك گیانتان لێ دەسێنێتەوەو دەتانمرێنێ و، وەك یەکەم جارتان لێ دێتەوە ﴿ثم يحييكم﴾ دیسانەوە بۆ جارێکی تر گیانتان پێ دەبەخشێتەوەو زیندووتان دەکاتەوە ﴿ثم إليه ترجعون﴾ ئەوسا ئیتر بۆ لێکۆڵینەوەو لێپرسینەوە،گشتتان تەنها بۆلای خۆی دەگەڕێنەوە, کەوابوو باوەڕ نەبوون بە دەسەڵات و هێزی خوایەکی بەتوانای وا، گێلی وخۆ وێڵ کردن وسەرگەردانیە.

## نیشانەی دەسەڵات و توانایی خوا:

خوای کارزان لەم ئایەتانەدا هێندێ ئایەت و نیشانەی دەسەڵات و توانایی خۆی باس دەکات، هەتا پتر سەرنجی مرۆڤ رابکێشی بۆئیمان و باوەڕ هێنان، بۆیە دەفەرموێ: ﴿[٢٩] هو الذى خلق لكم ما فى الأرض جميعا﴾ ئەو خوایە کە لە زەوییدا –لەبەر سوودو قازانجی ئێوە– هەمووجۆرە شتێکی دروستکرد ﴿ثم استوى إلى السماء﴾ لەپاشان کەویستی ئاسمان دروست بکا، کردیە حەوت ئاسمان. (تەبەریی) لەم جێگایەدا چەند وتەیەك دەهێنێ بۆ تەفسیری بێژەی (إستوى)، لە پاشان هەموویان دەداتە دواوە، چونکە لەگەڵ ماناو مەبەستی زمانی عەرەبدا بۆ ئەم جێگایە ناگونجێن، دواتردەڵێت: (الإستواء هنا يعنى: العلو والإرتفاع، علا عليها علو ملك وسلطان، لا علو إنتقال

وزوال). ﴿فسواهن سبع سموات﴾ پاشان بەوێنەی حەوت ئاسمانی ڕێك وپێك و قەشەنگ، ئاسمانەکانی ڕێکخست ﴿وهو بكل شئ عليم﴾ هەر ئەویشە بە هەمووشتێ زاناو ئاگایە، جائیتر زاتێکی خاوەن دەسەڵاتی ئاوا، چۆن ناتوانێ ئێوە پاش مردن زیندوو بکاتەوە..؟!تێبینی: بێژەی سەماوات (١٩٠) جار لە قورئاندا هاتووە.

**ئادەمزاد جێنشینی یەکترن :**

خوای کارجوان لە ئایەتەکانی پێشەوە منەتی نایە سەر بەندەکانی خۆی کە: تەواوی ئەوشتانەی لە زەوییدان هەر بۆخێرو قازانجی ئەوانی دروستکردووە، ئینجا دەست دەکات بە باسی دروستبوونی ئادەمیی خۆی باوە (ئادەم)ﷺ و جێنشینکردنی لەزەوییدا بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری ژیانی خۆیان وحوکمکردن بە بەرنامەکەی خوا لەناو بەندەکاندا، بۆیە ئەفەرموێ: ﴿[30] وإذ قال ربك للملائكة﴾ ئەوکاتە وەبیر بێنە ئەی موحەممەد!!ﷺ کەپەروەردگارت بەفریشتەکانی گوت: ﴿إنی جاعل فی الأرض خليفة﴾ کەبە راستیی من دەمەوێ جێنشینێك لە زەوییدا بۆ ئاودانکردنەوەی زەویی دابنێم. زانایانی تەفسیر بۆ دیاریکردنی ئەو (خەلیفە)یە دووڕاو بۆچوونی جیاوازیان هەیە: یەکێ دەڵێ: ئەو خەلیفەیە (ئادەم) پێغەمبەرەو ﷺ، خوای میهرەبان کردوویەتی بە جێنشینی خۆی بۆ جێبەجێ کردنی فەرمان و بڕیارەکانی خۆی، یەکێکی دی پێیوایە ئەو خەلیفەیە هەم ئادەم و، هەم نەوەکانیەتی، بەدرێژایی رۆژگار دەبنە جێنشینی یەکتر. ئیمامی (تەبەریی) یش دەڵێ: مەبەست بەو جێنشینە (خلیفە)یە ئەو گەلانەن کە یەك لەدوای یەك دێن ودەچن، لەوەش دەچێ هەر ئەمەلە گەڵ رۆحی قورئاندا گونجاو تربێت، چونکە کەس ناتوانێ جێنشینی خوابکات. خوایش باشتر ئەزانێ. ﴿قالوا أتجعل فيها من يفسد فيها ويسفك الدماء﴾ فریشتەکانیش گوتیان: ئاخۆ تۆ کەسێکی وا دەکەیتە جێنشین کە کاریفەسادو بەدکاری وخوێن ڕێژی بکات..؟! ﴿ونحن نسبح بحمدك ونقدس لك﴾ لەحاڵێکدا ئێمە هەر خەریکی تەسبیح تەحمیدی تۆین و، تۆ بە پیرۆز رادگرین و ، لە هەرشتێکی نەشیاوو نەگونجاو بەدوورت دەتگرین...؟! ﴿قال إنی اعلم مالا تعلمون﴾ پەروەردگاریش لەوەڵامیاندا فەرمووی: بێگومان ئەوی من ئەیزانم ئێوە نایزان. (ئیبن کەسیر) ئەڵێ: کە فریشتەکان دەڵێن: (اتجعل فیها من یفسد فیها..) مەبەستیان رەخنەگرتن و سووکایەتی و حەسوودی و ئیرەیی بردن بە ئادەم نەبوو، بەڵکو پرسیارە لەحیکمەتی خوا بۆ دروستکردنی ئادەم و، جێنشینکردنی لەزەوییدا، وەك بڵێن ئاخۆ حیکمەت چی بێ لە دروستکردنی ئادەمدا، لەکاتێکدا فەساد و بەدکاریی دەکەن؟!. خاوەنی تەفسیری(تەسهیل)یش دەڵێت: خوا خستیە دڵیانەوە کە: جۆری ئادەمیی بەسروشت بەدکار وخوێن ڕێژیان تێدایە، بۆیە ئەوپرسیارەیان کرد. بەهەرحاڵ باسی دروستکردنی باوە(ئادەم)- وەك مامۆستا (موحەممەد عەبدە) ئەڵێت-

الجزء الأول — سورة البقرة

وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً
قَالُوٓاْ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحْنُ
نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ قَالَ إِنِّيٓ أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ
(٣٠) وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ
فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِي بِأَسْمَآءِ هَٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ (٣١) قَالُواْ
سُبْحَٰنَكَ لَا عِلْمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ
(٣٢) قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ أَنۢبِئْهُم بِأَسْمَآئِهِمْ فَلَمَّآ أَنۢبَأَهُم بِأَسْمَآئِهِمْ قَالَ
أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ إِنِّيٓ أَعْلَمُ غَيْبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَأَعْلَمُ مَا
تُبْدُونَ وَمَا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ (٣٣) وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُواْ
لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ وَٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ
(٣٤) وَقُلْنَا يَٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ وَكُلَا مِنْهَا رَغَدًا
حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ (٣٥)
فَأَزَلَّهُمَا ٱلشَّيْطَٰنُ عَنْهَا فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ وَقُلْنَا ٱهْبِطُواْ
بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ وَلَكُمْ فِي ٱلْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ (٣٦)
فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٍ فَتَابَ عَلَيْهِ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ (٣٧)

لە(متشابهات)ـەو، تـەنها خـوای گـەورە خۆی حەقیقەتەکـەی چاك دەزانـێ ، بۆیـە ئێمـەیش بـەو شێوەیە کە خۆی مەبەستیەتی ملمان کەچکردووەو بڕوامان پێ هێناوەو، تەسلیمی بووین.

رێنمایی ئایەتی (٣٠):

١- ئەوەی نەزان بێ دەبێ هەمیشە لە پیاوی زاناودانا بپرسێ و، زاناش لە پرسیار کـەران هـەڵ نەشاخێ و، بە جوانی وەڵامیان بداتەوە.

تێبینی: وشەی(مەلائیکە) لەقورئاندا (٦٨)جار هاتووە.

**رێزی (ئادەم) لە فریشتە پترە :**

ئینجا بۆئەوەی پتر رۆشن و ئاشکرا بێ کە: ئەم ئادەمزاد گەڵێ توانای نهێنی ونادیـاری تێدایـەو، دەشتوانێ زۆر بەباشـی کاروبـاری زەوی بـەڕێوە ببـات، خـوا فـەرمویێ: ﴿[٣١] وعلـم آدم الأسمـاء كلـها﴾ خـوا نـاوی هەمووشـتێکی ، پێوست- بۆژیانی ئادەم خۆیی و نەوەکانی هەتا رۆژی سەلا- فێری (ئادەم) کردو خستیە مێشکییەوەو ئامادەی کرد کەبۆ هەموو سەردەمێ چی بکاو چۆن بژی. (ئیبن عەباس) ئەڵێ: تەنانەت ناوی قاپ وقاچاغ و کەوچکیشی فێر کرد. ئایا دەزانیت کە: نـاوی (ئـادەم) لـەقورئانی پیرۆزدا (٢٥) جـار بـەم شێوەیەی خـوارەوە هـاتووە؟: سوورەتی (بەقەرە) ئایـەتی:٣١، ٣٣، ٣٤، ٣٥،٣٧ .(ئالی عیمران) ئایـەتی:٣٣، ٥٩.(مائیدە) ئایەتی:٢٧.(ئەعراف) ئایـەتی:١١، ١٩، ٢٦، ٢٧، ٣١، ٣٥، ١٧٠ (ئیسرا) ئایەتی:٦١، ٧٠ (کەهف) ئایـەتی:٥٠ (مەریم) ئایـەتی:٥٨ (تاها) ئایـەتی:١١٥، ١١٦، ١١٧، ١٢٠، ١٢١ (یاسین) ئایـەتی:٦٠. ﴿ثم عرضهم على الملائكة﴾ لە پاشان خستیە بەردەم فریشتەکان ﴿فقال انبؤنى بأسماء هؤلاء إن كنتم صادقين﴾ فەرمووی: دەسائەگەر ئێوە راست دەکەن لەئادەم بەتواناترو باشترن بۆجێنشینیەتی، فەرموون ناوی ئەوشتانەم پێ بڵێن ﴿[٣٢] قالوا سبحانك لا علم لنا إلا ماعلمتنا﴾ ئەوانیش گوتیان: تۆ پاك وبێخەوشی، ئێمە هیچ زانیارییەکمان نیە، مەگەر ئەوەی خۆت فێرت کردبین ﴿إنك انت العليم الحكيم﴾ بێگومان تەنها هەر ئەتۆی خوای زۆر زاناو کارجوان و، گشت کارەکانیشت پڕلەحیکمەت و لەجێی‌خۆیدان، جا دوای دەرکـەوتنی بـێ دەسـەڵاتی فریشتـەکان و ددان پێنانیـان ﴿[٣٣] فقال يا آدم انئبهم بأسمائهم﴾ خـوا فـەرمووی: ئـەی ئادەم! دەساتۆ ناوی ئەوشتانەیان پێ بڵێ ﴿فلما انبأهم بأسمائهم﴾ ئینجا کەئادەم دەست بە جێ ئەوانی ئاگادار کردو ناوەکانی پێگوتن ﴿قال الم اقل لكم إني اعلم غيب السموات والأرض﴾ خوا فەرمووی: ئەی - لە پێشەوە- من پێم نەگوتن کـە: مـن گشت غـەیب و نادیـاریی ئاسمانـەکان و زەویـی ئـەزانم ﴿واعلم ماتبدون وما كنتم تكتمون﴾ وچاکیش ئاگادارم بەو شتانەی کە ئێوە ئاشکرای ئەکەن، وەلەوەش دەیشارنەوە .

رێنماییەکانی ئایەتی (٣١-٣٣):

١- زانست و زانیاری بێ سنووری خوا بۆ فێرکردنی هەموو شتێ بە ئادەم.

٢- شەرەف و فەزیڵـەتی زانست و زانایـان لەبەرامبـەر نەزانانەوە، وەکو لـەم فـەرموودەدا هاتووەکە رێزو پلەو پایەی زاناو فێرخواز روون دەکاتەوە، بەشێوەیەك فریشتەکانیش باڵی رێزو حورمـەت دادەنێن بۆکەسی زانا، بۆیـە دەفەرموێ: ((وإن الملائكة لَتَضَعُ أَجْنِحَتَها رِضاً لِطالِبِ العِلْمِ)) (ئەبی داود) ریوایەتی کردووە.

**فریشتە بۆ قەدرو رێزی ئادەم سوژدە دەبەنە بەری :**

ئایەتـەکانی پێشـوو گـەورەیی و نرخـی ئـادەمیی، لەگـەڵ بـێ توانـایی و دەسەوسـان وەستانی فریشتـەکانیان لەبەرامبەر ئادەمدا دەرخست، جالێرەدا خودا فەرمان بەفریشتەکان ئەدا کە لەبەرامبەریەوەوە سووژدەو کڕنووشی

ڕێز بۆئادەم بەرن، بۆیە دەفەرموێ: ﴿[٣٤] وإذقلنا للملائكة اسجدوا لآدم﴾ ئەی پێغەمبەر! ئەودەمەیان وەبیر بێنە کەئێمە بەفریشتەکانمان گوت: سوژدەو کڕنووش بەرنە بەرئادەم ﴿فسجدوا إلا إبليس﴾ ئینجا ئەوانیش دەست بەجێ کڕنووشیان برد ، شەیتان نەبێت ﴿ابى واستكبر﴾ ئەو سەرپێچیکردو خۆی بەزلزانیی ﴿وكان من الكافرين﴾ و بوو بەیەکێ لەبێ باوەڕان" لەراستییدا خوا نەبێ هیچ کەسێك کونهو حەقیقەتی (فریشتە) نازانێ" ئەوەندە نەبێ کەهەریەکەیان وهەردەستەیان کاروبارێکیان پێ سپێردراوەو،ئەوانیش بەملکەچییەوە جێبەجێی دەکەن, (شەیتان) یش : هەرکاری شەڕو خراپەکاری دەکات، وەك لە فەرموودەوە وەرگیراوە. ئێمەش بەوشێوەیە کە قورئان وفەرموودە باسیان دەکەن، باوەڕ بەبوونیان دەکەین و ملکەچین.

ئاگادارییەك: زانایان سەبارەت بە (ئیبلیس) کە ئاخۆ فریشتە بووە وپاشان سەرپێچی کردووە وەك هێندێ دەڵێن، یان هەر جنۆکەیەو لەناو فریشتەکاندا ژیاوەو، فەرمان بەسوژدەکە ئەویشی گرتووەتەوە..؟ رایان جیاوازە.

جا بۆ ئەم وەڵامە دوو ڕا هەیە، هەریەکەیشیان بەهەندێ بەڵگە پشتگیری لە خۆی دەکات، بەڵام پاش رامان لە هەردوو راکە, ئێمە بەم بەڵگانەی خوارەوەدا دەتوانین بڵێین (ئیبلیس) هیچ کات وساتێ‌فریشتە نەبووە:

یەکەم: فریشتەهیچ کاتێك سەرپێچی لەفەرمانی خوا ناکات، وەکو دەفەرموێ: (لا یعصون الله ما أمرهم) ٦/٦٦.

دووەم: فریشتە زاوزێ ناکاو زورپەتی لەدوا ناکەوێت،بەڵام (ئیبلیس) زاوزێ ئەکا و زاڕۆڵەو نەوەی هەیە، وەکوخو خۆی دەفەرموێ: (أفتخذونه وذريته أولياء من دوني..) ٥/١٨.

سێیەم: سروشتی فریشتەو ئیبلیس –وەك لە فەرموودەی رەواندا هاتووە–زۆر لێکجیاوازە: ((خُلِقَتِ الملائكةُ من نورٍ، وخُلِقِ الجانُّ من مارجٍ من نارٍ)) فریشتە لە نوور بەدی هێنراوە، شەیتانیش لە بڵێسەو گڕی ئاگر،بێگگومان ئەمدوانەش زۆر لەیەك دوورن.

چوارەم: لە سوورەتی (کەهف)دا هاتووە: (ئیبلیس) لە توخم ورەگەزی جنیەکانە،وەکو دەفەرموێ: (فسجدوا إلا إبليس كان من الجن) ٥٠/١٨،(ئیبن کەسیر)یش لەتەفسیرەکەیدا هەر ئەم راو بۆچوونەی هەیە.

رێنمایی ئایەتی (٣٤):

١- دەبێ لەبەرامبەر گشت نیعمەتەکانی خواوە شوکرانە بژێرین.

٢- دەبێ لەخۆبەزلزانین و حەسوودیی وئێرەیی خۆ دووربگرین، چونکە هەر ئەو دوو نەخۆشییە بوونە هۆی ئەوەی کە شەیتان سوژدە نەبا. بەڵێ.. حیکمەتی خوا وابوو کە باوە (ئادەم)مان دروست بکاو، فریشتە کڕنووشی بۆ بباو و، لە بەهەشتدا نیشتەجێیان بکا، وەك ئەفەرموێ: ﴿[٣٥] وقلنا ياآدم اسكن أنت وزوجك الجنة﴾ گوتمان: ئەی ئادەم! خۆتوو هاوسەرەکەت (حەوا) لە بەهەشتدا نیشتەجێ ببن ﴿وكلا منها رغدا حيث شئتما﴾ و لە هەرکوێی‌حەز دەکەن رزق وڕۆزی بەفراوانی بخۆن ﴿ولا تقربا هذه الشجرة﴾ بەڵام تەنها نزیکی ئەم دەرختە مەکەونەوە. قورئانی پیرۆز جۆری درەختەکە دیاری ناکات، بۆیە ئێمەیش هەروا دەکەین و لێی بێ دەنگ دەبین چونکە هەر خوا خۆی دەیزانێ ﴿فتكونا من الظالمين﴾ ئەگینا ئەگەر بیخۆن لە ستەمکاران دەبن ﴿[٣٦] فأزلهما الشيطان عنها﴾ ئینجا شەیتان پێیهەڵخزاندن ولەخشتەی بردن ﴿فأخرجهماماكانا فيه﴾ ئیتر لەونازو نیعمەتە دەری پەڕاندن و بەدەر کردنیدان ﴿وقلنا اهبطوا بعضكم لبعض عدو﴾ وئێمەیش پێمانگوتن" مادەم ئەو پارێزەتان شکاند، ئیتر لێرەجێتان نابێتەوەو، دەبێ هەمووتان لە بەهەشت دابەزنە خوارەوە، هەندێکیشتان ببنەدوژمنی هەندێکتان، واتە:لەبەر ئەوە کە مرۆۋ بە

سروشت حەزی لەدنیاو ژیان وژیوارە، بێ سۆ لەگەڵ یەکتر دەبنە ناحەزو نەیار ، مەبەست بەوانەش لەم ئایەتەدا بچنە سەرزەوی: باوەئادەم و، دایەحەواو، شەیتانی نەحلەتییە، واتە: بەگوێکردنی شەیتان بووبەهۆی دەرکردنیان لە بەهەشت، کەوابوو ئێوە وریابن بەرفەرمانی شەیتان مەکەن ﴿ولكم فى الأرض مستقر ومتاع إلى حين﴾ وزەویش هەتاماوەیەکی دیاریکراو بۆ مردنتان، نیشتنگەو جێگەی ژیان و سوود وەرگتنتانە ، پێغەمبەر-صلى الله عليه وآله وسلم-دەفەرموێ: ((خَيْرُ يومٍ طَلَعَتْ فيه الشمسُ يومُ الجمعةِ، فيه خُلِقَ آدمُ، وفيه أُدْخِلَ الجنةَ،وفيه أُخْرِجَ منها)) موسلیم. واتە: رۆژی جومعە لە گشت رۆژەکانی دنیامەزنترو باشترە: چونکە کەئادەم دروسکرا، رۆژیهەینی بوو، رۆژی هەینی برایە ناو بەهەشتەوە، هەر رۆژی هەینیش بوو کرایە دەر. ئینجا ئادەم پاش هەڵەکەیان بەخۆدا هاتنەوەو زانییان تووشی گوناح بوونەو، بۆیە لەخوا پاڕانەوە کەلێیان ببووری، وەکو دەفەرموێ: ﴿[٣٧] فتلقى آدم من ربه كلمات﴾ ئادەم لەلایەن پەروەردگاریەوە بەئیلهام چەند وشەو وتەیەکی پێگەیشت و گوتیان: (ربنا ظلمنا أنفسنا وإن لم تغفر لناوترحمنا لنكونن من الخاسرين) جا ئەویش بەو وشانە لاڵەو نزای لەخوا کرد ﴿فتاب عليه﴾ وخوایش تەوبەی لێ وەرگرت ﴿إنه هو التواب الرحيم﴾ چونکە بەڕاستیی هەر خۆیەتی زۆر زوو نزاوپاڕانەوە لە تەوبەکەران وەردەگریت، زۆریش میهرەبان و دڵاوایە. خاوەنی تەفسیری(مەراغیی)دەڵێت: لەم جێگایەدا چەند باسێك هەیەو، راڤەکەرانی قورئانیش درێژەیان پێداوە، بەڵام ئێمە کورتیی دەکەینەوە:

٣- یەکەم: سەبارەت بە چۆنیەتی و شێوەی دابەزینی باوە(ئادەم) ودایە (حەوا) لە بەهەشت بۆ سەر زەوی، تەفسیرەکان گەلێ ریوایەتیان هێناوە، بەڵام بەلای زانایانەوە زۆربەیان لە راست ناچن و دەشگونجێت کە دەست هەڵبەستی جوولەکەبن. دووەم: مەسەلەی دروستبوونی دایە(حەوا) لە پەراسووی بابە(ئادەم) مانای ئەوە نییە کە هەر لە خودی ئادەم و پەراسووەکەی ئەو دروستکرابێ! بەڵکو مانای وایە کە (حەوا)ش هەر لەو توخم و تەرح و رەگەزەیە کە ئادەمی لێدروست بووە، وەك خوا خۆی دەفەرموێ: (وخلق منها زوجها..) یان دەفەرموێ: (ومن آياته أن خلق لكم من أنفسكم أزواجا..) ٣٠/٢١. سێیەم: ئەو فەرموودەیە کە (بوخاریی) و (موسلیم) هێناویانەو دەڵێت: ((واستَوْصوا بالنساء خيرا، فإنهن خُلِقْنَ من ضِلَعٍ أعْوَجَ..)) واتە :هەمیشە بەرامبەر بە ژنان، چاك بێژو چاك کاربن، چونکە ئەوان لە پەراسوویەکی لار بەدیهێنراون، پەراسووش وەك دەفەرموێ: ((وإن أعوجَ شيءٍ في الضِلْعِ أعلاهُ فإن ذَهَبْتَ تُقيمُهُ كَسَرْتَهُ، وإن تَرَكْتَهُ لم يَزَلْ أعوجَ..)) واتە: بەڕاستیی لارو خێچترینی بەشی پەراسوو، بەشی لای سەروویەتی، گەر بتەوێ راستی بکەیتەوە، دەیشکێنی، خۆ ئەگەر وازیشی لێ بهێنی، ئەوا هەمیشە بەلارو خێچی دەمێنێتەوە، کەواتە بەردەوام لەگەڵ ژناندا باش و تەباشبن، هەتا بتوانن پێکەوە بژین و، باری ژیانتان تێك نەچێت. چوارەم: سەرپێچی باوە ئادەم و، خواردنی لەدرەختە قەدەغە کراوەکە، پێش ئەوسات و کاتە بووە، ببێتە پێغەمبەر، چونکە پێغەمبەران سەرپێچی خودا ناکەن و، ئەو کارەش بۆ شانی پەیامبەران دەست نادا، جالەبەرئەوە:

أ- دەبێ خواردنی درەختەکە لەدەست ئەنقەست نەبووبێت، بەڵکو لە رێی لەبیرچوونەوە بووبێ، بەڵام کە:بە(عیصیان) ناوبراوە، چونکە شکاندنی ئەو فەرمانە کارێکی گەورە بووەو لەپێغەمبەران ناوەشێتەوە.

ب- ئەو رووداوە لە(متشابهات)ی قورئانەو، ناگونجێ مانا راستەو خۆیەکەی خۆی لێ بگیردرێ، بەڵکو دەبێ حەقیقەتەکەی بەخوا حەواڵە بکرێ، پێشینانیشمان هەر ئەمە دەڵێن. مامۆستا(خاڵ)یش لەم جێگایەدا-سەبارەت

بەمەسەلەی ئادەم- رای(موحەممەد عەبدە)ی هێناوە، (سەیید)یش : دەربارەی ئەو بەهەشتەی کە باوە ئادەم ودایە حەوای تیامانەوەو، دەربارەی حەقیقەتی فریشتە کێن وچین؟ یان ئیبلیس و شەیتان کێیە؟ ئاخۆ چۆن خوا گفتوگۆی لەگەڵ کردن؟ چۆن وەڵامیان دایەوە؟ بۆ وەڵامی هەموو ئەوپرسیارانە دەڵێت: ئەمانە گشت لەو شتە نادیارانەن کە تەنها خودی خوای گەورە خۆی ئەیانزانێ و، دەم تێکوتانیشیان بێ کەڵکە، بەڵام ئیمان وبڕوابوون پێیان واجیب وپێویستە، ئیتر دوای ئەوە هیچ پێوست ناکات ئێمە خۆمان لەو بەرەو ژوورو هەڵدێرەیە بدەین.

**ڕێنمایەکانی ئایەتی (٣٥-٣٧):**

١- ڕێزی بابە(ئادەم) و، ڕێزی نەوەکانی بەلای خواوە زۆرە.

٢- گوناح ونافەرمانی خوا دەبێتە هۆی لە دەستدانی نازوو نیعمەت.

٣- دەبێ تا دنیا مابێ دوژمنایەتی شەیتان لەبیر نەکرێ.

٤- تەوبەو پەشیمانی لە گشت گوناحێك و، هەرگیز نەگەڕانەوە بۆیان.

الجزء الأول — سورة البقرة

قُلْنَا ٱهْبِطُوا۟ مِنْهَا جَمِيعًا ۖ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّى هُدًى فَمَن تَبِعَ
هُدَاىَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٣٨﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟
وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَآ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٣٩﴾
يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتِىَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ وَأَوْفُوا۟ بِعَهْدِىٓ
أُوفِ بِعَهْدِكُمْ وَإِيَّٰىَ فَٱرْهَبُونِ ﴿٤٠﴾ وَءَامِنُوا۟ بِمَآ أَنزَلْتُ
مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَكُمْ وَلَا تَكُونُوٓا۟ أَوَّلَ كَافِرٍۭ بِهِۦ ۖ وَلَا تَشْتَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِى
ثَمَنًا قَلِيلًا وَإِيَّٰىَ فَٱتَّقُونِ ﴿٤١﴾ وَلَا تَلْبِسُوا۟ ٱلْحَقَّ بِٱلْبَٰطِلِ
وَتَكْتُمُوا۟ ٱلْحَقَّ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٤٢﴾ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟
ٱلزَّكَوٰةَ وَٱرْكَعُوا۟ مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ ﴿٤٣﴾ ۞ أَتَأْمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلْبِرِّ
وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ وَأَنتُمْ تَتْلُونَ ٱلْكِتَٰبَ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٤٤﴾
وَٱسْتَعِينُوا۟ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ ۚ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى ٱلْخَٰشِعِينَ
﴿٤٥﴾ ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُوا۟ رَبِّهِمْ وَأَنَّهُمْ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ ﴿٤٦﴾
يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتِىَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ وَأَنِّى فَضَّلْتُكُمْ
عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٧﴾ وَٱتَّقُوا۟ يَوْمًا لَّا تَجْزِى نَفْسٌ عَن نَّفْسٍ شَيْـًٔا وَلَا
يُقْبَلُ مِنْهَا شَفَٰعَةٌ وَلَا يُؤْخَذُ مِنْهَا عَدْلٌ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿٤٨﴾

حزب ١

٧

**تێبینی:** بێژەی (شەیتان) لەقورئاندا (٧٠)جار هاتووەو، (شەیاتین)یش (١٧)جار، (ئیبلیس) (١١)جار.

وەك لە ئایەتەکاندا دیارە خوای گەورە دووجار فەرمان بە دەرچوونی باوە ئادەم ودایە حەوا لەبەهەشتدا دەدا، جارێکیان بۆ نیشتەجێ بوون وگوزەرانە لەسەر زەوییدا تاماوەیەك کە باس کرا، دووەم جاریشیان ئەمەیە کە ئێستائەفەرموێ: ﴿[٣٨] قلنا اهبطوا منها جميعا﴾ ئەوجا گوتمان دەبێ هەمووتان لەبەهەشت دابەزنە خوارەوە- بۆ تاقیکردنەوەتان- ﴿فإما يأتيكم مني هدى﴾ ئەوسا هەرکە لەلایەن منەوە ڕێ نیشاندرێکتان بۆ هات ، دەبێ پەیڕەوی لێ بکەن ﴿فمن تبع هداي﴾ جا هەرکەسێك پەیڕەوی لە هیدایەت و ڕێ نیشاندەری منی کرد ﴿فلا خوف عليهم ولا هم يحزنون﴾ ئیتر نەهیچ ترس و بیمێکیان دەبێ و، نە چاو لەدوایش دەبن وخەفەت بخۆن بۆ پاشە ڕۆژیان، واتە: نە لە هاتنی قیامەت دەترسن، وە نەخەفەت دەخۆن بۆ ئەوەی لە دنیادا لەدەستیان چووە، لەسوورەتی(تاها)شدا دەفەرموێ: (قال اهبطا منها جميعا بعضكم لبعض عدو فإما يأتينكم مني هدى فمن اتبع هداي فلا يضل ولايشقى). ﴿[٣٩] والذين كفروا وكذبوا بآياتنا﴾ ئەوانەش بە ئایەت و نیشانەکانی ئێمە بێ باوەڕبوون و بە درۆیان خستنەوە ﴿أولئك أصحاب النار هم فيها خالدون﴾ ئەوانە دەبنە هاوڕێی دۆزەخ و" بۆ هەتا هەتاییش تێیدادەمێننەوە.

## هاندانی (بەنی ئیسرائیل) بۆ موسڵمان بوون :

باسی دروستکردنی (ئادەم) پەیامبەری کردوو، ئەو هەموو نازو نیعمەتانەشی خستەپێش چاوو، لەتەواوی ئادەمزادیشی خواست کە بڕوابێنن ، ئینجا دێتە سەر باسی جوولەکەو،گەلێ نازونیعمەتیشیان وەبیر دێنێتەوە، تابەڵکو چاولەبەربن و بڕوابێنن.. جا لەبەر ئەوە کە پتر لاڕێیی و لاساریی جوولەکە بزانرێ، نزیکەی جزمێکی ئەم سوورەتە باس لە جوولەکە دەکات، واتە: لە ئایەتی ٤٠-١٤٢ لە خراپیی و فەسادکاری ئەوان دەدوێ، وەکو دەفەرموێ: ﴿[٤٠] یابنی إسرائیل﴾ ئەی کوڕان و نەوەی ئیسرائیل!. ئیسرائیل:بەواتای بەندەی خوا هاتووە !. زاناکان دەڵێن: مەبەست بە(ئیسرائیل): (یەعقووب)ی کوڕی (ئیبراهیم)ـە ، درودو سڵاویان لەسەربێت، (ئیبن عەباس) دەڵێ: تاقمێ لە جوولەکە هاتنە لای پێغەمبەر-صلى الله عليه وآله وسلم- پێیفەرموون: ئەرێ دەزانن کە: مەبەست بە ئیسرائیل (یەعقووب)ـە ؟ گوتیان: بەڵێ، ئەمیش فەرمووی: ((اللهم فاشهد)). تەیالسیی ریوایەتی دەکا. ﴿اذکروا نعمتی التی أنعمت علیکم﴾ بیر لەو نازو نیعمەتانەم بکەنەوە: پێمدان ورشتم بەسەرتاندا ﴿وأوفوا بعهدی﴾ ووەفاش بەو پەیمانە بکەن، کە لەگەڵ مندا گرێتاندا وبەئەمەك بن و، بەباشی گوێرایەڵی بڕیارەکانم بن و، بڕوا بە موحەممەدی پێغەمبەرم ﷺ بێنن و بۆ مەردمیشی باس بکەن ﴿أوف بعهدکم﴾ ئەوا منیش بە پەیمانی ئێوە وەفا دەکەم و بە ئەمەك دەبم لەگەڵتاندا ، واتە: پاداشتان ئەدەمەوەو دەتانبەمە ناوبەهەشتەوە ﴿وإیای فارهبون﴾ دەسا دەبێ تەنها لە من بترسن و، پەیڕەوی هەر لە فەرمانی من بکەن ﴿وآمنوا بما أنزلت مصدقا لما معکم﴾ ودەبێ بەو قورئانەش ناردوومەتە خوارەوە باوەڕ بکەن، کە بەراستدانەری ئەو تەوراتەی لای ئێوەیە ﴿[٤١] ولا تکونوا أول کافربه﴾ وەلەباتی ئەوە ببنە یەکەم بڕوادار پێی ، نەبنە پێشەنگ و یەکەم کەس لەوانەی کە باوەڕی پێناکەن، چونکە ئێوە خاوەن کتێبن و لە کتێبەکەتاندا باس لەم قورئانە کراوە ﴿ولا تشتروا بآیاتی ثمنا قلیلا﴾ و ئایەتەکانی من بە نرخ وبە بەهایەکی کەم مەفرۆشن" واتە دین و ئایینتان بە پارەو پوولێکی کەم و کەمبەها مەگۆڕنەوە ﴿وإیای فاتقون﴾ و دەبێ تەنها هەر لە سزاو تۆڵەی من بەراستیی پارێز بکەن وبترسن.

## راستییەکان مەشێوێنن :

خوای بەدەسەڵات فەرمان بەجووەکان دەکات کە هەق وناهەق تێکەڵ نەکەن و لەمەردمی نەشێوێنن، بۆیە دەفەرموێ:﴿[٤٢] ولا تلبسوا الحق بالباطل﴾ و جل و بەرگی کارو بەرنامەی باتڵ و ناڕەوا، مەکەنە بەرهەق و،هەق وناهەق تێکەڵ مەکەن و، لە خۆتان ولە خەڵکی مەشێوێنن ﴿وتکتموا الحق﴾ و راست و هەقیش مەشارنەوەوحاشاتان نەبێ لێی ﴿وأنتم تعلمون﴾ بۆخۆیشتان چاك ئەزانن کە ئەم قورئانە (کەلام)ی (ئەزەل)ی خوایەو،دەبێ بێ سێ ودوو وەری بگرن ﴿[٤٣] وأقیموا الصلاة وآتوا الزکاة وارکعوا مع الراکعین﴾ فەرمانیان پێ بکە با بە تێرو تەسەل نوێژ ئەنجام بدەن و" بەشێکی داراییشیان بە زەکات بدەن و، لەگەڵ رکوعبەراندا، رکوع بەرن، واتە: لەگەڵ موسڵمانەکاندا نوێژ بەکۆمەڵ بکەن.

تێبینی: لەبەر شکۆمەندی زەکات وگرنگی وپێویستی بۆ کۆمەڵگەی مرۆڤ، لە قورئاندا خوای میهرەبان (٣٢)جار ناوی بردووە.

## خۆتان لە چاکە هەڵمەوێرن:

جوولەکەکان خەڵکیان هەڵدەنا بۆکردنی ئیش وکاری خێرو، پیاوەتی و جوامێریی، کەچی خۆشیان نەیان دەکرد! بۆیە خوای گەورە سەرزەنشتیان دەکاو دەفەرموێ: ﴿[٤٤] أتأمرون الناس بالبر﴾ ئاخۆ کەی راستە ئێوە

فەرمانی چاکە بەخەڵکی بدەن ﴿وتنسون انفسکم﴾ کەچی واخۆتان لەبیردەکەن و، گوێ نادەن ؟! ﴿وانتم تتلون الکتاب﴾ ولەکاتێکدا بۆخۆشتان کتێبی تەورات دەخوێننەوەو بەردەوام دەوری دەکەنەوەو، خوێندەوارن ؟! ﴿افلا تعقلون﴾ داخۆ بیرێکی وردو تیژ بەکار ناهێنن و، ژیرنابن و، لەو کارە ناپەسەندانە ناگەڕێنەوە؟ دیارە ئەم سەرکۆنەو سەرزەنشتکردنە بۆ هەموو جوولەکەو زانایەکە،لەهەر سەردەمێکدا بژی، چونکە دەبێ زاناکان سەرقافڵەو پێشەنگی کۆمەڵ و کۆمەڵگەبن،بۆ ئەنجامدانی هەموو کارێکی خێرو چاکەو،خۆلادان لەهەر کارێکی ناشیرین و ناپەسەند.

پێشەوا (عەلی) ﷺ لە بارەی زانای لاسارو، خوا پەرستی نالەبارەوە، چەندەجوان دەڵێت: (قَصَمَ ظَهْرِی رَجُلانِ: عالِمٌ مُتَهَتِّكٌ، وجاهِلٌ مُتَنَسِّكٌ) واتە: لەکارو باری دیندا، دوو کەس پشتی منیان شکاندووە: زانایەکی سنوور بەزێنی ئاینی خودا، خواپەرستێکی نەفام و نەزان ..! هەزار ڕەحمەت لەو شاعیرەش کە ئەویش هەر لەم بارەیەوە دەڵێت:

لا تَنْهَ عَنْ خُلُقٍ وَتَأْتِيَ مِثْلَهُ — عارٌ عَلَيْكَ إذا فَعَلْتَ عَظيمُ

إبْدَأْ بنفسك فَانْهَهَا عن غَيِّها — فإذا انْتَهَتْ عنه فأنْتَ حَكِيمُ

فهناك يُقْبَلُ إن وَعَظْتَ ويُقْتَدَى — بالرأى منكَ ويَنْفَعُ التعليمُ

واتە: ئەگەر دەتەوێ مەردم گوێت بۆبگرێ وقسەت لێوەرگرێ،دەبێ پێش هەموو شتێك نەفسی خۆت ڕاست بکەیتەوەو لە خراپە لەغاویکەیت، ئینجا ئەوکاتە ئیتر پەندو ئامۆژگاریت بەکەڵك دێ و سوودبەخش دەبێت بۆ ئەم و ئەو.(ئەبولعەتاهیە)ش هەر بۆ پشتگیری لەو مانایە زۆر جوانی گوتووە:

وَصَفْتَ التُّقَى حتى كأنك ذو تُقىً — وريحُ الخطايا من ثيابك تَسْطَعُ

واتە: چییە بە چەشنێ پەسنی (تەقوا) دەکەیت، دەڵێیت خۆت لە خوا ترس و(موتتقی)ییت؟! کەچی هەر لەجل و بەرگەکەت، بۆنی گوناحان دێ. یەکێکی تریش دەڵێت:

وغيرُ تَقِيٍّ يأمرُ الناسَ بالتُّقى — طَبِيبٌ يُداوِی الناسَ وهوعَلِيلُ

واتە: مرۆڤێکی بێ تەقواو کەمتەرخەم لەخوا ناسیندا، فەرمان بەخەڵك بدا بە (تەقوا)، وەکو پزیشکێکی نەخۆشە کە دەرمانی خەڵك بکاو، کەچی بۆ خۆیشی لەشبەبارەو نەخۆش!

**بۆ خۆڕاگریی هانا بە نوێژ بەرن:**

ئینجا بۆ زاڵبوون بەسەر نەفس و ئارەزووداو، بۆ گەیشتن بەئاوات و ئامانجەکانی دنیاو قیامەت، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿[٤٥] واستعینوا بالصبر والصلاة﴾ بۆ گەیشتن بە ئاواتەکانتان پەلامار بدەنە نوێژو خۆڕاگرتن. واتە: بیرکردنەوە لەپاداشتی ئارامگرتن و، لە پاڕانەوەو لالانەوە لەنوێژدا، دەبێتە هۆی سەرکەوتنتان، جا کەوابوو دەبێ ئارامتان ببێ و، درێژە بەنوێژەکان بدەن ﴿وانها لکبیرة إلا علی الخاشعین﴾ بێگومان نوێژ خوێندن و خۆڕاگرتن لەسەرشانی چاکان و لە خواترسان نەبێ ئەرکێکی زۆر قورس و گەورەو گرانە ﴿[٤٦] الذین یظنون انهم ملاقوا ربهم﴾ ئەوانەیش ئەوکەسانەن کە سووردەزانن و بیروبڕوای پتەویان هەیە کە: لەڕۆژی سەڵادا دەچنە خزمەتی پەروەردگاری خۆیان ﴿وانهم إلیه راجعون﴾ و باوەڕی بتەویشیان هەیە کە تەنها بۆلای ئەو دەگەڕێنەوە" لای ئەویش بەری کێڵگەی خۆیان دەچنەوە.

رێنمایی ئەم دوو ئایەتە:

١) وای! چەند کارێکی بەدفەڕە کەسێ فەرمان بەچاکە بداو، بۆ خۆیشی نەیکا! بێگومان گوناح و تاوانکردن کارێکی دزێوو ناشیاوە، بەڵام بۆ (زانا)و مامۆستایان دزێوترو نەشیاوترە.

٢) لەکاتی ڕووبەڕوو بوونەوەی ڕووداوە دژوارو سەختەکاندا دەبێ پەنا ببەینە بەر نوێژ خوێندن و، خۆڕاگرو بە صەبر بین.

ئینجا لەبەرئەوەی کە جوولەکە لەخوا زۆر بێ ئاگاو غافڵبوون، بۆ جارێکی تر بانگیان دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿[٤٧] یا بنی إسرائیل اذکروا نعمتی التی انعمت علیکم﴾ ئەی نەوەی ئیسرائیل! ئەو نازو نیعمەت و چاکانەتان لەبیر بێت من ڕشتم بەسەرتاندا و پێمدان، هەتا هەمیشە بۆ من سوپاسگوزار و ملکەچبن ﴿وانی فضلتکم علی العالمین﴾ ئەی لەبیرتانە لەچاو خەڵکانی سەردەمی خۆتاندا، چۆن فەزڵ و ڕێزم لە ئێوە نا، واتە: لەباو باپیرانتاندا چەندین پەیامبەرو پاشاو پیاوی هەڵکەوتەم بەدیهێنا، دیارەئەو ڕیزلێنانە لەوان ،ڕێزلێنانە لە ئێوەش، لەفەرموودەیەکدا -کە ئیمامی (ترمزیی) هێناویەتیی- دەفەرموێ: ((الا إنکم وَفَیْتُمْ سبعینَ أمةً انتم خیرُها واکرَمُها علی الله)) واتە:ئێوە بەسەر حەفتا ئوممەتدا تێپەڕیون و، بەلای خواوە لەهەمووشیان باشترو بەڕێزتر بوون، کە وابوو لەپلەو پایەکەتان شەرمێ بکەن.

**کەس بە هانای خوانەناسانەوە نایەت:**

لێرەدا ئەو خەڵکە هوشیار دەکاتەوە کە بەو نازو نیعمەتەوە سەرقاڵ نەبن و، ئاگاشیان لەهاتنی ڕۆژە سەختەکەی بەرێ بێت، بۆیە فەرمووێ: ﴿[٤٨] واتقوا یوما لا تجزی نفس عن نفس شیئا﴾ لەو ڕۆژە خۆپارێزن وبترسن کە کەس فریای کەسناکەوێ و توانای هەڵگرتنی هیچ شتێکی نیە بۆی، هەتا بارو کوڵی سووك بکات، وەکو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: (ولا تزر وازرة وزر أخری) ﴿ولا یقبل منها شفاعة﴾ تکاو شەفاعەت و پاڕانەوەی کەسیش بۆ کەسێتر وەرناگیرێ، واتە: ئەگەر تکا کارێکیش دەست بکەوێت، هەر لێی وەرناگیردرێ.

(تەبەریی) دەڵێت: تکاو شەفاعەت لەوکەسانە وەرناگیردرێ کەلەسەر کوفرو بێباوەڕی مردبن، ئەگینا لە فەرموودەیەکدا کە(بوخاریی) و (موسلیم) هێناویانە هاتووەو دەفەرموێ:((..إنی خَبَأْتُ دَعْوَتِی شفاعةً لأمتی، وهی نائلةٌ إن شاءالله منهم، مَنْ لایُشْرِكُ بالله شیئا)) واتە: بەڕاستیی شەفاعەتی خۆمم بۆ ئوممەتەکەم داشاردووەو، هەرکەسێك هاوبەشی بۆخوا دانەنابێ بە ئیزنی خوا پێیدەگات ﴿ولا یؤخذ منها عدل﴾ هیچ پارەو بریتی و بارمتەیەکیشی "گریمان گەر هەشبێ" لێوەرناگیردرێ ﴿ولا هم ینصرون﴾ و کۆمەکیشیان پێناکرێ بۆ ڕزگار بوونیان لەسزای خوا.

**ڕوونکردنەوەیەك** مەسەلەی تکاو شەفاعەتی پەیامبەران -علیهم الصلاة والسلام- بۆگوناهباران لەدوارۆژدا بەم شێوەیە:

١) هەندێ ئایەت لەقورئاندا هەیە، کە تەماشایان دەکەیت بەڕواڵەت ڕەتی شەفاعەت دەکەنەوەو ددانی پیا نانێن بۆ نموونە ئایەتی: (..لا بیع فیه ولا شفاعة..) (٢/٢٥٤).

٢) هەندێکیشیان بەراشکاوی ددانی پێدا دەنێن،بەڵام دەڵێن: بەمەرجێ خوا مۆڵەت بداو ڕازی لەسەربێ ، وەك دەفەرموێ: (یوم یأت لا تکلم نفس إلا باذنه..) (١١/١٠٥)، یان دەفەرموێ: (ولا یشفعون إلا لمن ارتضی) (٢١/٢٨)

جالەبەرئەوەی ئەم دووجۆرە ئایەتانە لە قورئاندا هەن، زاناکان بوونەتە دوو دەستەوە: دەستەیەکیان ددان بەشەفاعەتدا دەنێن و، دەربارەی ئەو ئایەتانەش کە بە ڕەها "مطلق" هاتوون لەگەڵ ئەو ئایەتانەدا کە ددان بەتکادا دەنێن بەم جۆرە یەکیان دەخەن ودەڵێن: بێشك کە شەفاعەت بەبێ فەرمان وبڕیاری خوای گەورە نابێ.

ئەودەستەکەی تریش ئایەتەکانی شەفاعەت هەروەکو خۆیان بێدەسکاری دەهێڵنەوە و، شەفاعەت دەدەنە دواوە.

کەوابوو لەقورئاندا دەقێکی وانیە کە بە ڕاشکاوانە ددان بنێت بەبوونی شەفاعەتدا، هەربۆیە لەناو زاناکانیشدا جیاوازی وناکۆکی پەیدابووە. بەڵام فەرموودەی راست و(صەحیح) هەیە کەددان بەشەفاعەتدا بنێت، وەك دەفەرموێ (شفاعتی لأهل الكبائر من امتی، فمَنْ كَذب لم يَنَلْها)) (ترمزیی) و(ئەبوداود) ریوایەتیان کردووەو (ئەلبانی)یش دەڵێت: صەحیحە" واتە: تکاوشەفاعەتی من لەناو ئوممەتمدا بۆخەڵکە خاوەن گوناحە گەورەکانە ، جا هەرکەسێك باوەڕی بەشەفاعەت نەبێ، بێبەش دەبێ لێی. خاوەنی تەفسیری(أضواء البيان) دەڵێت: بەپێی قورئان وفەرموودەو کۆی رای زاناکان شەفاعەت بۆ موسڵمانان هەیە، بەڵام دەبێ بە فەرمان ومۆڵەتی خوابێ، وەك دەفەرموێ: (..من ذالذی يشفع عنده إلا بإذنه) (٢٥٥/٢) یان دەفەرموێ: (يومئذ لاتنفع الشفاعة إلا من اذن له الرحمن) (١٠٩/٢٠) یان دەفەرموێ (لاتغنی شفاعتهم شيئا إلا من بعد ان يأذن الله لمن يشاء ويرضى) (٢٦/٥٣) هەروەك دەڵێ دەرگای شەفاعەت بۆ خوانەناس و بێباوەران داخراوە. (بەندە)ش بەلامەوە وایە کە: بێ سۆ شەفاعەت بۆ موسڵمانان هەیە.

**رونکردنەوەیەك لەبارەی شەفاعەتەوە:** (لالەکایی) لە کتێبی (شرح أصول إعتقاد أهل السنة والجماعه) بەرگی ٣ لاپەڕە (١١٦٠)دا دەڵێت: مەسەلەی شەفاعەت وتکای پەیامبەر ﷺ لە ڕۆژی قیامەتدا بەم جۆرەیە:دیارە کە خوای گەورە پێش هەمووشتێك، خۆی لەم سوورەتانەدا باسی شەفاعەت دەکات، بۆ نموونە سوورەتی: (زومەر/ ٤٤، بەقەرە/ ٢٥٥، یوونس/ ٣، نەجم/ ٢٦، نە بەء/ ٣٨، سە بەء/ ٢٣، مە ریە م/ ٨٧، ئە نبیاء/ ٢٨، تاها/١٠٩). ئەوجا زاناکان ئەو ئایەتانەی کە ددان بە شەفاعەتدا نانێن کۆیان کردوونەتەوەو یەکیان خستوون. بێجگە لەو ئایەتانەش چەندین فەرموودەی ڕاست و ڕەوان هەیە بۆ پشتگیری لە بوونی شەفاعەت، وەکو دەفەرموێ: ((إن لكل نبیٍّ دعوةً مُستَجابَةً، وإنی اُحِبَّ أن أدّخِرَ دعوتِی شفاعةً لأمتی يوم القيامة)) موسلیم، واتە: بەڕاستیی هەموو پێغەمبەرێك داواو داخوازییەکی قبوولکراوی‌لای خوای هەیە، منیش پێم خۆشە ئەو داوایەی خۆم بکەمە زەخیرەی ڕۆژی بەرێ بۆشەفاعەتی ئوممەتەکەم. یان وەکو ئەم فەرموودەیە: ((أُعْطِيتُ خمسا لم يُعْطَهُنّ أحدٌ من الأنبياء قبلی، وذكر منها الشفاعة)) بۆخاریی وموسلیم، واتە: پێنج شتم پێدراوە کە بەهیچ پێغەمبەرێ بەر لەمن نەدراوە:ئەوجا یەکەیەکە ناوی هێنان و، پاشان شەفاعەتیشی باسکرد. وە بەدەر لەمانەش، (١٦) فەرموودەی (صەحیح)ی‌تر لەریوایەتی‌ترەوە دەربارەی بوونی شەغاعەت هاتوون، هەروەها (مقامەل مەحموود) کە لەئایەتی (ئیسرا)دا هەیە مەبەست پێی‌ئەوەیە کەخوای‌گەورە لەناو هەموو پەیامبەراندا شەفاعەتی بە موحەممەد ﷺ بەخشیوە. جگە لەوانەش هێمان چەندین فەرموودەی (مشهور) و (متواتر) هەن و، ددان بەوەدا دەنێن کەخەڵکانێك دەچنە دۆزەخەوەو، پاشان پێغەمبەر ﷺ شەفاعەتیان بۆ دەکاو دێنە دەرەوە. بۆیە ئەهلی سوننەت و جەماعەتیش لەسەر ئەو ڕایەن کە تاوانبارانی (موحّد) بەپێی تاوانەکانیان دەسوتێنرێن، بەڵام بەهەمیشە لەناودۆزەخدا نامێننەوەو پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ شەفاعەتیان بۆدەکا.

ئەوانەیش کە نکوولی شەفاعەتیان کردووە دوودەستەن: (موعتەزیلە) و(خەواریج)، ئەمانیش لای ئەهلی سوونەت وجەماعەت هەردووکیان بە گومڕاو سەرلێشێواو دادەنرێن.

(حافیزی حەکەم)یش /ڕەحمەتی خوای لێبێ لەکتێبی (أعلام السنة المشهورة)دا شەفاعەت دەکات بە شەش بەشەوە:

١) شەفاعەتە گەورەکەی بەرپابوونی ڕۆژی قیامەت، کەخوای‌گەورە لەو ڕۆژەدا خۆی داوەریی نێوان بەندەکانی‌دەکا، ئەمەیان تایبەتە بەڕابەرو پێشەوامانەوە موحەممەد ﷺ .

٢) شەفاعەت بۆکردنەوەی دەروازەکانی بەهەشت، دیارە کە یەکەم کەسیش دەیانکاتەوە پێغەمبەرمان موحەممەدە ﷺ .

٣) شەفاعەت بۆ رزگارکردنی ئەو ئیماندارانەی بڕیاری دۆزەخیان بۆدراوە.

٤) شەفاعەت بۆخەڵکانی ئەهلی (تەوحید) کەلەناو دۆزەخ بێنە دەرێ.

٥) شەفاعەت بۆ بەرزکردنەوەی پلەو پایەی هێندێ لەبەهەشتییەکان.

٦) شەفاعەت بۆ سوککردن وکەمکردنەوەی سزای (ئەبوو تالیب)ی مامی پێغەمبەر ﷺ .

ئەمە کورتەی ڕاو بۆچوونی ئەهلی سووننەت وجەماعەت بوو لەبارەی شەفاعەتەوە، هیواداریـن توانیبێتمان بەشێکی زۆری روون بکەینەوەو، پێغەمبەری هێژایشمان شەفاعەتمان بۆ بکات.

**بەنی ئیسرائیل لە فیرعەون رزگار دەبێ:**

ئینجا خوای گەورە یەکە یەکە نیعمەت و چاکەکانی خۆی پتر بۆ (بەنیئیسرائیل) باس دەکاو دەفەرموێ: ﴿[٤٩] وإذ نجيناكم من آل فرعون﴾ نەوەکانی یەعقووب! بیر لەوە بکەنەوە کە باوو باپیرانتانمان لە هەڵمەتی دڕندانەی فیرعەون و فیرعەونیان ڕزگار کرد ﴿يسومونكم سوء العذاب﴾ کە هەمیشە ئێوەیان بەسەختی سزا دەدا ﴿يذبحون ابناءكم﴾ کوڕەکانتانیان سەردەبڕین و ﴿ويستحيون نساءكم﴾ ئافرەتەکانتانیان دەهێشتەوە بۆ کارەکەریی وخزمەتگوزاری ﴿وفي ذلكم بلاء من ربكم عظيم﴾ ئەو رزگار بوونەشتان لەلایەن پەروەردگارتانەوە تاقیکردنەوەیەکی گەورە بوو بۆتان ﴿[٥٠] وإذ فرقنا بكم البحر﴾ یادی ئەو کاتەش بکەنەوە دەریاکەم بۆ شەقکردن، واتە: ئەو دەریایە بوو بەزەوییەکی وشك و، ئێوە لە دوازدە جێگاوە لێی پەڕینەوە ﴿فانجيناكم واغرقنا آل فرعون﴾ ئەوسا ئێوەمان رزگار کردو، لەوەو دواش فیرعەون و شوێنکەوتووەکانیمان نوقم کردو خنکاند ﴿وانتم تنظرون﴾ ئێوەش بەچاوی سەر بینیتان وتماشاتان دەکرد.

الجزء الأول    سورة البقرة

وَإِذْ نَجَّيْنَٰكُم مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ
يُذَبِّحُونَ أَبْنَآءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَآءَكُمْ ۚ وَفِى ذَٰلِكُم بَلَآءٌ
مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ ﴿٤٩﴾ وَإِذْ فَرَقْنَا بِكُمُ ٱلْبَحْرَ فَأَنجَيْنَٰكُمْ
وَأَغْرَقْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ ﴿٥٠﴾ وَإِذْ وَٰعَدْنَا مُوسَىٰٓ
أَرْبَعِينَ لَيْلَةً ثُمَّ ٱتَّخَذْتُمُ ٱلْعِجْلَ مِنۢ بَعْدِهِۦ وَأَنتُمْ ظَٰلِمُونَ
﴿٥١﴾ ثُمَّ عَفَوْنَا عَنكُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٥٢﴾
وَإِذْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْفُرْقَانَ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿٥٣﴾
وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَٰقَوْمِ إِنَّكُمْ ظَلَمْتُمْ أَنفُسَكُم
بِٱتِّخَاذِكُمُ ٱلْعِجْلَ فَتُوبُوٓا۟ إِلَىٰ بَارِئِكُمْ فَٱقْتُلُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ ذَٰلِكُمْ
خَيْرٌ لَّكُمْ عِندَ بَارِئِكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ
﴿٥٤﴾ وَإِذْ قُلْتُمْ يَٰمُوسَىٰ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ نَرَى ٱللَّهَ جَهْرَةً
فَأَخَذَتْكُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ ﴿٥٥﴾ ثُمَّ بَعَثْنَٰكُم مِّنۢ
بَعْدِ مَوْتِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٥٦﴾ وَظَلَّلْنَا عَلَيْكُمُ
ٱلْغَمَامَ وَأَنزَلْنَا عَلَيْكُمُ ٱلْمَنَّ وَٱلسَّلْوَىٰ ۖ كُلُوا۟ مِن طَيِّبَٰتِ مَا
رَزَقْنَٰكُمْ ۖ وَمَا ظَلَمُونَا وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٥٧﴾

وَإِذْ قُلْنَا    ٨

تێبینی: ١- ئەو دەریایە لێیانداو پەڕینەوە لێی دەریای (قلزم) بوو، کە ئێستا پێیدەڵێن دەریای (سوور)، خوای گەورە ئەو دەریایەی کردە دوازدە بەشەوە، بە ئەندازەی ژمارەی نەوەکانی یەعقووب. ٢- باسی خنکاندنی فیرعەون ورزگاربوونی بەنی ئیسرائیل لەدەستی، لە چەندین سوورەتی قورئاندا هاتووە، وەك ئایەتی (١٦٣)ی (ئەعراف) و ئایەتی (٥٢)ی (ئەنفال) و(١٠٣)ی (ئیسراء) و ٦٣-٦٦)ی (شوعەرا) و (٥٥)ی (زوخروف) و (١٧)ی (دوخان).

## بەنی ئیسرائیل خوویان دایە گوێرەکە پەرستن؛

پاش ئەوە کە لەدەریاکە پەڕینەوە داوایان لەمووسا کرد کە کتێبێکیان لە لایەن پەروەردگاریانەوە بۆ بێنێ تا کاری پێبکەن، کەچی سەرگەردان و سەر لێشێواو بوون و لەو ماوەیەدا دەستیان کردە گوێرەکە پەرستن، لەوبارەوە خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿٥١ وإذ واعدنا موسى أربعين ليلة﴾ ئەی لەبیرتانە بەڵێنمان بە موساداو گوتمان: دوای چل شەوی تر تەوراتتان بۆ ئەنێرین ﴿ثم اتخذتم العجل من بعده﴾ کەچی هەرکە ئەوهات بەدەم بەڵێنەکەمانەوە، خێرا ئێوە گوێرەکەتان پەرست و کردتانە خوا ! ﴿وانتم ظالمون﴾ دیارە بەم کارە بوونە ستەمکارو سنووری خواتان بەزاند، درێژەی ئەم ڕووداوە لە ئایەتی (١٤٢)ی (ئەعراف) و (٨٦)ی (تاها) دا پتر هاتووە. ﴿٥٢ ثم عفونا عنكم من بعد ذلك﴾ کەچی دوای ئەو هەموو کارە ناشیاوانەتان، هیشتای ئێمە هەر چاوپۆشیمان لە تاوانەکانتان کردو سزامان نەدان ﴿لعلكم تشكرون﴾ بەڵکو سوپاسگوزاری بکەن و جارێکی تر تاوانی وانەکەن.

هەر بۆ زانیاریی: لەقورئانی پیرۆزدا (١٣٣) جار ناوی (مووسا) لەم سوورەتانەداهاتووە: (بەقەرە)١٢جار (ئالی عیمران)١ (ئە نبیاء)٣ (مائیدە)٣ (ئەنعام)٣ (ئەعراف)١٩ (یوونس)٨ (هوود)٣ (ئیبراهیم)٣ (ئیسراء) ٣ (کەهف)٢ (مەریەم)١ (تاها)١٧ (ئە نبیاء)١ (حەج)١ (مۆمینوون)٢ (٠فورقان)١ (شوعەرا)٨ (نەمل)٣ (قەصەص)١٨ (عەنکەبووت)١ (سەجدە)١ (ئەحزاب)٢ (صافات)٢ (غافیر)٥ (فوصصیلەت)١ (شوورا)١ جار(زوخروف)١ (ئەحقاف)٢زاریات)١ (نەجم)١ (صەف)١ (نازیعات)١ (ئەعلا)١. ﴿٥٣ وإذ آتينا موسى الكتاب والفرقان﴾ بیری ئەوکاتە بکەنەوە کە کتێبی تەوراتی -جیاکەرەوەی ڕەواو ناڕەوا- مان دا بەموسا ﴿لعلكم تهتدون﴾ تا بەڵکو ڕێنوێن و بەختیاربن و، ڕێگەی حەق بدۆزنەوە ﴿٥٤ وإذ قال موسى لقومه يا قوم﴾ ئەی لەبیرتانە ئەو دەمەی کەمووسا بەهۆزو گەلەکەی خوی وت: ئەی هۆزو گەلی من!: ﴿إنكم ظلمتم انفسكم باتخاذكم العجل﴾ بەڕاستی ئێوە کە گوێرەکەتان کردە خوای خۆتان و پەرستان، بەوە ستەمێکی گەورەتان لەخۆتان کردو پێی گوناهبارو تاوانبار بوون ﴿فتوبوا إلى بارئكم﴾ دەسا پەشیمان ببنەوەو بگەڕێنەوە لای بەدیهێنەرتان وتەوبە بکەن ﴿فاقتلوا انفسكم﴾ وەرن لەباتی ئەوە خۆتان بکوژن، واتە: ئەوانەتان وا گوێرەکەتان نەپەرستووە، گوێرەکە پەرستەکان بکوژن، ئینجا ئەوانیش فەرمانەکەیان جێبەجێکرد، وەك لە تەوراتدا هاتووە. ﴿ذلكم خيرلكم عند بارئكم﴾ ئەو پەشیمان بوونەوەو خۆکوشتنە، بەلای پەروەردگارتانەوە، لە گوناهو نافەرمانی چاکترە بۆتان ﴿فتاب عليكم﴾ ئینجا خوایش دوای لەناوبردنی هەندێك، تەوبەی لێوەرگرتن ﴿إنه هو التواب الرحيم﴾ چونکە بەراستی هەر خۆیەتی کە هێجگار تەوبە قبووڵکەرو، لێبوردەو میهرەبانە.

## بەنی ئیسرائیل داوای بینینی خوا دەکەن!

ئەم ئایەتانەش باس لەوە دەکەن- پاش مراندنیان بەهەورە تریشقەکەو زیندووکردنەوەیان- داوای دیتنی خوا دەکەن کە بینینی خوا لەتوانای مرۆڤدا نیە: بۆیە دەفەرموێ: ﴿٥٥ وإذقلتم يا موسى لن نؤمن لك حتى نرى الله جهرة﴾ ئەی لەبیرتانە کە حەفتا کەستان لەگەڵ مووسادا چوونە کێوی (توور) بۆ داوای لێبوردن لەتاوانی گوێرەکە پەرستن، کەچی بە مووساتان گوت: هەتا بەئاشکراو بەچاوی خۆمان خوا نەبینین، هەرگیز بڕوا ناکەین ئەم کتێبەت لەلایەن خواوە بۆهاتبێت؟! ﴿فأخذتكم الصاعقة وانتم تنظرون﴾ ئینجا لەو دەمەدا هەورە تریشقە گرتنیی و خۆێشتان بەچاو تەماشاتان دەکرد ﴿٥٦ ثم بعثناكم من بعد موتكم﴾ پاشان دوای ئەو مەرگەتان زیندوومان کردنەوە

﴿لعلكم تشكرون﴾ تا بەڵكو سوپاسگوزار بن. ئایەتی (٢٠-٢٢) ی (مائیدە)ش هەر بەخشش وبەهرەیەکی تری خوا هەیە بەسەریانەوە باسی دەکا، هەرچەند لەوێش هەر نکوولی وسەرپێچیان کرد.

**خوا گەزۆو شیلاقەی بۆ باراندن:**

ئینجا پاش باسکردنی لابردنی هێندێ بەڵاو موسیبەت لەسەریان، برێ لە نیعمەتی خۆی باس دەکابۆیان ودەفەرموێ: ﴿[٥٧] وظللنا عليكم الغمام﴾ یەکێتر لەنازو نیعمەتەکانمان ئەمەیە کەکاتێ لە (میسر) دەرچوون ولەدەریاکە پەڕینەوەو کەوتنە ناو گەرمایەکی ئێجگار زۆرەوە هەورمان بەلای سەرووتانەوە کردە سێبەر ﴿وانزلنا عليكم المن والسلوى﴾ و گەزۆو مەلی شەلاقە (هەوێردە)مان بۆناردن. (سەلوا): پەلەوەرێکی گۆشت خۆشە بەقەد کۆترێك دەبێ و بەکوردی شەلاقەی پێدەڵێن. ﴿كلوا من طيبات ما رزقناكم﴾ گوتمان دەسا لەو ڕزق وڕۆزیە پێماندراون بخۆن ﴿وما ظلمونا ولكن كانوا انفسهم يظلمون﴾ کەچی سوپاسگوزارییتان نەکردو سپڵەو بێ وەفابوون، ئێمەیش ڕۆزییەکەمان لێ گرتنەوە، بەوەخۆیان ستەمیان لە خۆیان کرد، نەك لە ئێمە.

الجزء الأول — سورة البقرة

وَإِذْ قُلْنَا ٱدْخُلُوا۟ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةَ فَكُلُوا۟ مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ رَغَدًا
وَٱدْخُلُوا۟ ٱلْبَابَ سُجَّدًا وَقُولُوا۟ حِطَّةٌ نَّغْفِرْ لَكُمْ خَطَٰيَٰكُمْ
وَسَنَزِيدُ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٥٨﴾ فَبَدَّلَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ قَوْلًا
غَيْرَ ٱلَّذِى قِيلَ لَهُمْ فَأَنزَلْنَا عَلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ رِجْزًا مِّنَ
ٱلسَّمَآءِ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴿٥٩﴾ ۞ وَإِذِ ٱسْتَسْقَىٰ مُوسَىٰ
لِقَوْمِهِۦ فَقُلْنَا ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْحَجَرَ ۖ فَٱنفَجَرَتْ مِنْهُ
ٱثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْنًا ۖ قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٍ مَّشْرَبَهُمْ ۖ كُلُوا۟
وَٱشْرَبُوا۟ مِن رِّزْقِ ٱللَّهِ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٦٠﴾
وَإِذْ قُلْتُمْ يَٰمُوسَىٰ لَن نَّصْبِرَ عَلَىٰ طَعَامٍ وَٰحِدٍ فَٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ
يُخْرِجْ لَنَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلْأَرْضُ مِنۢ بَقْلِهَا وَقِثَّآئِهَا وَفُومِهَا
وَعَدَسِهَا وَبَصَلِهَا ۖ قَالَ أَتَسْتَبْدِلُونَ ٱلَّذِى هُوَ أَدْنَىٰ
بِٱلَّذِى هُوَ خَيْرٌ ۚ ٱهْبِطُوا۟ مِصْرًا فَإِنَّ لَكُم مَّا سَأَلْتُمْ ۗ
وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ ٱلذِّلَّةُ وَٱلْمَسْكَنَةُ وَبَآءُو بِغَضَبٍ مِّنَ
ٱللَّهِ ۗ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَيَقْتُلُونَ
ٱلنَّبِيِّۦنَ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ۗ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا۟ وَّكَانُوا۟ يَعْتَدُونَ ﴿٦١﴾

٩

**لاساریی و بەراوەژوویی جوولەکە:**

پاش ئەوە لەگەڵ مووسا لەمیسر دەرچوون، خوا فەرمانی پێکردن کە: بچنە(بیت المقدس) و جیهادی (عەمالیق)ە بێ دینەکان بکەن، کەچی لەوەخۆیان هەڵوارد و بەگوێیان نەکرد، ئەوەتا دەفەرموێ: ﴿[٥٨] وإذ قلنا ادخلوا هذه القرية﴾ دیسان بیری بەخششێکی ترمان بکەنەوە، ئەو دەمە کە- دوای ئەو سەرگەردانیەی تێیدا بوون لەچۆڵ ودەشتی(سینا)دا- پێمانگوتن: بچنە ناو ئەم شارو ئاوایییەی (بیت المقدس)ـەوە ﴿فكلوا منها حيث شئتم رغدا﴾ حەز لە هەر نیعمەتێ دەکەن زۆرو فراوانە لێی بخۆن، واتە: جۆرەها خواردەمەنی تیا دەست دەکەوێ ﴿وادخلوا الباب سجدا﴾ وگوتیشمان هەر لە دەروازەی دیاریکراوی شارەکەوە بەرێزوو بەحورمەتەوە بچنە ژوورێ وسوژدەی شوکر بەرن ﴿وقولوا حطة﴾ وبشڵێن: پەروەردگاری ئێمە! تاوانەکانمان بووەرێنەو لێمان خۆش ببە. ((حطة)):بەزمانی جوولەکە مانای لێبووردنە ﴿نغفر لكم خطاياكم﴾ ئەوکاتە ئێمەیش لە هەڵەو تاوانەکانتان دەبورێین ﴿وسنزيد المحسنين﴾ و سەرەڕای ئەوەیش پاداشی چاکە کاران زۆر بەزیادەوە دەدەینەوە ﴿[٥٩] فبدل الذين ظلموا قولا غير الذى قيل لهم﴾ کەچی ستەمکارولەسنوور دەرچووەکان هەڵسان، ئەو وشەو گوتارەی پێیان وترابوو گۆڕییان ولە باتی سوژدەو ملکەچی کەوتنە گاڵتە و لەباتی ئەوەی بڵێن (حطة) وتیان (حَبَّة). ﴿فأنزلنا على الذين ظلموا رجزا من السماء بما كانوا يفسقون﴾ ئینجا لەبەر ئەوەکە نافەرمانیان کرد ئێمەش لە ئاسمانەوە سزایەکمان ناردە سەریان.

## مووسا ئاوی خواست بۆ پەیڕەوانی:

دیارەکە ئایەتەکانی ئەم سوورەتە یەك لەدوای یەك هەرباسی نیعمەت و بەخششەکانی خوایان بۆدەکەن ، بۆیە دیسانەوە ئەفەرموێ: ﴿[٦٠] وإذ استسقى موسى لقومه﴾ لەبیرتان بێت ئەوکاتە کەلە میسر دەرچوون و تینوویەتیی وبێ ئاوییەکی زۆرتان توشبوو، مووسا بۆقەوم وکەسەکەی داوای ئاوی کرد، ﴿فقلنا اضرب بعصاك الحجر﴾ ئینجا ئێمەیش پێمان گوت: دەسا بە دار دەستەکەت لەوبەردە بدە ﴿فانفجرت منه اثنتا عشرة عينا﴾ مووساش لە بەردەکەیداودەست بە جێ دوانزە کانیاوی لێهەڵقوڵی" بە ژمارەی دوازدەتیرەکەیان، وەکو ئەفەرموێ: ﴿قد علم كل أناس مشربهم﴾ ئیتر هەموو تیرەیەك جێی ئاوخواردنەوەی خۆی زانی، بێ ئەوەی تووشی دەمە دەمێ و چەلەحانێ بن ﴿كلوا واشربوا من رزق الله﴾ ئینجا پێمان وتن: دەسا لەو رۆزیی ونیعمەتەی خوایە بخۆن وبخۆنەوە، واتە: ئەوە گەزۆو شەلاقە بخۆن، ئەوەیش کانیاوی زۆر بێ ماندووبوون بخۆنەوە ﴿ولا تعثوا في الأرض مفسدين﴾ ئیتر لە زەوییدا بەدکاریی و فەساد مەکەن.

## خراپ بە چاك دەگۆڕنەوە:

ئینجا لێرەدا تاوانێکی تریان دەخاتەروو، ئەوەبوو هەمیشە بڕووبیانووی زۆریان لە مووسا دەگرت، ئەویش پەیتا پەیتا بیانووەکانی دەبڕین، بەڵام هەرکۆڵیان نەئەدا، چونکە لای فیرعەون فێری ببوون" بۆیە ئەفەرموێ: ﴿[٦١] وإذ قلتم يا موسى﴾ ئەی لە بیرتانە ئەودەمە کەبە مووساتان گوت: ئەی مووسا! ﴿لن نصبر على طعام واحد﴾ هەرگیز ئێمە لەم چۆڵی سینایەدا لەسەر یەك جۆرە خواردەمەنی: (گەزۆو شەلاقە) ئۆقرە ناگرین و رازی نابین ﴿فادع لنا ربك يخرج لنا مما تنبت الأرض﴾ لەبەرئەوە داوا لە پەروەردگارت بکە لەو رزق ورۆزیی و بەروبوومەی زەوی دەیروێنێ ﴿من بقلها وقثائها﴾ لە سەوزەوات و خەیارو ﴿وفومها و عدسها وبصلها﴾ سیر و نیسك و پیاز، بۆمان بەرهەم بێنێ ﴿قال أتستبدلون الذي هو أدنى بالذي هو خير﴾ مووسا لە وەڵامدا گوتی: چۆن ئێوە شتی خراپ بەچاك ئەگۆڕنەوە؟ واتە: سیرو پیاز بە گەزۆو شەلاقە ئەگۆڕنەوە؟! ﴿اهبطوا مصرا فإن لكم ماسألتم﴾ جا ئەگەر ئەتانەوێ لەم جۆرە خواردنە رزگارتان بێ ، سەربەرەو خواربنەوە بۆ هەر شارێ پێتان خۆشە (بیابانی سینا بەجێ بێڵن)، چونکە بێگومان لەوێ هەرچیتان بوێ هەیە ﴿وضربت عليهم الذلة والمسكنة﴾ لەبەر ئەو بیروباوەڕە لاسارانەیان تووشی سەرشۆڕیی و نانی ریسوایی و زەلیلی وبێ ئەنوانیی بوون کە ئیتر هەرگیز لە کۆڵیان نابێتەوە، چونکە تێناکۆشن و جیهاد ناکەن، تا دوژمن لەوڵات و نیشتمانیان دەر پەڕێنن ، بۆیە ﴿وباؤا بغضب من الله﴾ بە ئەوپەڕی خەشم و قینی خواوە هاتنەوە ﴿ذلك بأنهم كانوا يكفرون بآيات الله﴾ چونکە زۆر سپڵەو بێ بڕوا بوون بەئایەت وبەڵگەوموجیزەکانی خوا ﴿ويقتلون النبيين بغير الحق﴾ هەر بەناهەق پەیامبەرانیان دەکوشت (ئەشعیاو زەکەریاو یەحیا)یان سەربڕی!! ﴿ذلك بما عصوا وكانوا يعتدون﴾ چونکە هەمیشە هەر سەر پێچیان دەکردو، خەریکی دەست درێژیکردن بوون و هەق وراستییەکانیان ژێر پێ دەکرد، لەفەرموودەیەکدا هاتووەو دەفەرموێ: ((الكِبْرُ بَطَرُ الحق وغَمْطُ الناس)) موسلیم. لەفەرموودەیەکی ترداهاتووە: ((أشدالناس عذابا يوم القيامة رجل قتله نبی، أو قتل نبيا، وإمام ضلالة، وممثل من الممثلين)) پێشەوا ئەحمەد.

## ئیمان و ئاکاری چاکە مایەی بەختیارییە:

جا دوای باسکردنی هەندێ لە تاوان وناپاکیەکانی جوولەکە، ئەوسا بەکورتی ئەفەرموێ: ﴿[٦٢] ان الذين آمنوا﴾ بە راستیی ئەوانەی وا بە بەرنامەکەی موحەممەد ﷺ بڕوایان هێنا ﴿والذين هادوا﴾ وپەیڕەوانی مووسا، پێش

هاتنی ئەم پەیامبەرە ﴿والنصارى﴾ و پەیڕەوانی عیسا ﴿والصابئين﴾ وسوببیی مەزەبەکان، ئەوانە کە لە ئاییینی مووساو عیسا لایانداو بوونە فریشتە پەرست ﴿من آمن بالله واليوم الآخر﴾ هەرکەسێکیان بڕوای تەواوی بەخواو بە ڕۆژی دوایی هەبێ ﴿وعمل صالحا﴾ وئاکاری خێرو چاکە بکەن ﴿فلهم اجرهم عند ربهم﴾ لای پەروەردگاریان کرێ و پاداشتیان بۆ هەیە ﴿ولا خوف عليهم ولا هم يحزنون﴾ هیچ ترس وخەفەتێکیشیان تووش نابێت، واتە: هەرکەسێك لەسەر بەرنامەی هەرپەیامبەرێك بووبێ و، پاشانیش بڕوای بەخواو بەڕۆژی دوایی هەبێ و، ئەهلی خێرو چاکەیش بێت، ئەوە لای خوای گەورە نرخ وبایەخی خۆی هەیە ، مەگەر ئەو ئاییینەیان سڕابێتەوە.

**سەرنج و تێبینی:**

١-لە تەفسیری (صفوة البيان)دا هاتووە کە سوببیی وەك خۆیان دەڵێن لەسەر ئاییینی (صابئ بن شيث بن آدم)ن !.

٢- لە (الفاظ القر آن الكريم)دا هاتووە : سوببیی دوودەستەن ، دەستەیەکیان یەهوودیی و نەسرانین و لەعێراقدان، دەستەی دووهەمیان بت پەرستن و لە (حران)ن.

٣- (تفسير التحرير والتنوير) دەڵێ: سوببیی ئاییینێکی کۆنەو لەناوچەی (کلدان) لەعێراق سەریان هەڵداو پەیڕەوانیان لەنێوان (خاپور) و (دیجلە) و(فورات)دان . دیارە ئاییینێکی ئاڵۆزو بێسەرو بەریان هەیە بۆیە هەندێ ئەستێرە دەپەرستن و هەندێ فریشتەو هەندێ بتان .

**جوولەکە پەیمانیانداو، شکاندیشیان!:**

دیسان باس هەر باسی جوولەکەیە، چونکە ئەوان دوای ئەو هەموونیعمەت وبەخششانە هەر سەرپێچییان دەکرد و پەیامبەرانیان دەکوشت وبەڵێنەکانیان هەڵئەوەشاندەوە، بۆیە ئێستاش ئەفەرموێ: ﴿[٦٣] واذ اخذنا ميثاقكم﴾ ئەی بیرتانە پەیمانمان لێ وەرگرتن کە کار بەتەورات بکەن ﴿ورفعنا فوقكم الطور﴾ وکێوی (توور)یشمان وەك سێبەرێ بەسەرتانەوە ڕاگرت، تابەچاوی سەر دەسەڵاتمان ببینن ولەسەر هەق ئۆقرە بگرن ﴿خذوا ما آتيناكم بقوة﴾ ئینجا پێمان وتن:ئەو بەرنامەیەی پێمانداون بە هەموو هێزەوە بیگرن" ئەگینا ئەم کێوە دەدەین بەسەرتانا ﴿واذكروا مافيه﴾ وچیشی تێدایە هەمیشە لەبیرتان بێ وبەوردیش کارو ڕفتاری پێبکەن ﴿لعلكم تتقون﴾ بەڵکو لە ئەنجامدا لەخواترس وخۆپارێزبن و، لەسنوورەکانی دەرنەچن ﴿[٦٤] ثم توليتم من بعد ذلك﴾ کەچی دوای ئەو هەموو بەڵێن و پەیمانە رووتان وەرگێڕاو پشتتان لەڕێبازی خوا هەڵکردو پەیمانەکەتان هەڵوەشاندەوە ﴿فلولا فضل الله عليكم ورحمته﴾ خۆئەگەر بەزەیی و فەزڵ و میهرەبانی خوا نەبووبا لەسەرتان، کەتەوبەی لێوەرگرتن ﴿لكنتم من الخسرين﴾ لەدەستەی زیان لێکەوتوان و زەرەر مەندان دەبوون.

الجزء الأول — سورة البقرة

إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ
مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ
عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾ وَإِذْ
أَخَذْنَا مِيثَٰقَكُمْ وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ ٱلطُّورَ خُذُواْ مَآ ءَاتَيْنَٰكُم
بِقُوَّةٍ وَٱذْكُرُواْ مَا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾ ثُمَّ تَوَلَّيْتُم مِّنۢ
بَعْدِ ذَٰلِكَ فَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ لَكُنتُم مِّنَ
ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٦٤﴾ وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ ٱلَّذِينَ ٱعْتَدَوْاْ مِنكُمْ فِى ٱلسَّبْتِ
فَقُلْنَا لَهُمْ كُونُواْ قِرَدَةً خَٰسِـِٔينَ ﴿٦٥﴾ فَجَعَلْنَٰهَا نَكَٰلًا لِّمَا
بَيْنَ يَدَيْهَا وَمَا خَلْفَهَا وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٦٦﴾ وَإِذْ قَالَ
مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تَذْبَحُواْ بَقَرَةً قَالُوٓاْ أَتَتَّخِذُنَا
هُزُوًا قَالَ أَعُوذُ بِٱللَّهِ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٦٧﴾ قَالُواْ
ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِىَ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لَّا فَارِضٌ
وَلَا بِكْرٌ عَوَانٌۢ بَيْنَ ذَٰلِكَ فَٱفْعَلُواْ مَا تُؤْمَرُونَ ﴿٦٨﴾
قَالُواْ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا لَوْنُهَا قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ
إِنَّهَا بَقَرَةٌ صَفْرَآءُ فَاقِعٌ لَّوْنُهَا تَسُرُّ ٱلنَّٰظِرِينَ ﴿٦٩﴾

١٠ — قالوا ادع

**جوولەکە ڕێزی شەممە دەشکێنن و دەبنە بەراز:**

پاش ئەوە خەڵکی گوندی (ئەیلە) پەیمانەکەیان شکاندو، بەرامبەر ڕۆژی شەممەش -کە بەڵێنیان دابوو ڕێزی لیبگرن- کەوتنە فرت وفێڵ، خوا دەفەرموێ: ﴿[٦٥] ولقد علمتم الذين اعتدوا منكم في السبت﴾ وخۆ بەحاڵی ئەوانەشتان زانی چیمان بەسەر هێنان، پاش ئەوە لەڕۆژی شەممەدا دەست درێژییان کردو ڕاوە ماسییان ئەنجامدا، پێشتر مووساش ﷺ بۆئەوەی ئەو ڕۆژە زیاتر خەریکی خواناسی بن و لەهەڵپەی دنیا دووربکەونەوە، ئیش وکاری لەو ڕۆژەدا لێ یاساغکردن، کەچی قسەکەی مووسایان شکاند، ئەوجا خوای کارجوانیش گەورەترین تۆڵەی لێسەندن، وەکودەفەرموێ: ﴿فقلنا لهم كونوا قردة خاسئين﴾ لەبەرئەوە بڕیارماندا و پێمانگوتن: دەسابچن ببنە مەیموونی ڕیسواو تڕۆکراو وپەست. جەماوەری زانایان دەڵێن: هەر بەواقیعی ئەوانە بوونە مەیموون، بەڵام دوای ئەوە، تەنها سێ ڕۆژ ژیان و لەدنیامانەوە، پاش سێ ڕۆژەکە ئیتر هەمووفەوتان و تیاچوون.(ئیبن جەریر)و (ئیبن حاتەم) لە (موجاهید)ەوە دەڵێن: ئەگەرچی بوونە مەیموون، بەڵام وێنەو سوورەتیان، لەسوورەت وسیمای ئادەمیی نەسڕایەوە، بەڵکو هەر ئەوەبوو کە دڵ و کاروکردەوەیان وەك کاروکردەوەی مەیموون دزێوو ناشیرین وپەست وڕیسوا بوو. ئەم مەسەلەیە لەسوورەتی(ئەعراف)، ئایەتی(١٦٦)دا، زیاتر باسکراوە، دەتوانی سوودی لێ وەرگریت. ﴿[٦٦] فجعلناها نكالا لما بين يديها وما خلفها﴾ ئینجا بەپەندو عیبرەتێکی وامان بردن کە هاوچەرخانیان و گەلانی پاش خۆشیان پەندیان لێ وەربگرن ﴿وموعظة للمتقين﴾ بۆخواناسان و خۆپارێزانیش هەمیشە مایەی ئامۆژگاری بێت.

ڕێنماییەکانی ئایەتی (٦٣-٦٥):

١) دەبێ وەفا بەپەیمان و ڕێکەوتننامەکان بکرێ.

٢) دەبێ بڕیارەکانی خوا بە وزەو بەتوند بگیردرێن.

٣) تەقوا تەنها بە جێبەجێ کردنی بڕیارەکانی خوا چنگ دەکەوێ.

٤) حیلەو فرت وفێڵ بۆ حەڵاڵکردنی حەرامکراوەکانی خوا، حەرامە.

٥) پاشە ڕۆژو ئەنجامی فێڵ بازان.

**جوولەکە لەبارەی ( مانگا )کەوە زۆریان گوت و، خواش بەنی توند کردنەوە:**

پاشان لەم چەند ئایەتەدا کە دێن بەخششێکی تریان دەخاتە پیش چاو، هەتا باشتر چاو لەبەربن بۆ خوای گەورە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿[٦٧] وإذ قال موسى لقومه إن الله يأمركم أن تذبحوا بقرة﴾ ئەوکاتە وەبیربێنە کە موسا بە هۆزەکەی خۆی گوت: بێگومان خوا فەرمانتان پێ دەدا کە مانگایەك سەربڕن، هۆی ئەو فەرمانەش ئەوەبوو کە: پیاوێکی زۆر دەوڵەمەندیان هەبوو، یەکێ لەمیراتگرەکانی بۆئەوە بەزوویی سامانەکەی بە میرات دەستکەوێت، بەناهەق کوشتیی وپاشان تەرمەکەیشی گواستەوە بۆ گوندێکی دیکە، ئەوساش میراتگرانی چوونە سەر خەڵکی گوندەکەوداوای خوێنیان لێئەکردن و دەیان گوت ئێوە کوشتووتانە! مووساش ﷺ بۆ ئاشکرا کردنی بکوژەکە هەوڵێکی زۆری لەگەڵدان ، بەڵام ئەمان هەر ڕاستییەکەیان نەدرکاند و، ئەوانیش هەرداوایان لەمووسا دەکرد کە لەخوا بخوازێ بەنیگاو وەحیی بەشکوم بۆیان ڕۆشن بکاتەوە، ئەویش فەرمووی: بۆ ئاشکرا بوونی بکوژەکە خوا فەرمانتان پێ دەکات: کە مانگایەك سەربڕن وپارچەیەکی لە لاشەی کوژراوەکە بدەن، ئەوسا بەفەرمانی خوای بەدەسەڵات زیندوو دەبێتەوەو پێتان دەڵێ: کێ کوشتوویەتی، ئەوانیش ﴿قالوا أتتخذنا هزوا﴾ وتیان: ئایا

مەسخەرەمان پێ ئەکەیت و ئەمانکەیتە گاڵتە جارِی خۆت؟! ئێمە چی دەڵێن و تۆیش چی دەڵێیت؟ دیارە بەلایانەوە ئەو قسەو باسە جێگەی سەرسوڕمان و مەسخەرە بوو ﴿قال أعوذ بالله أن أكون من الجاهلين﴾ مووسایش وتی: پەنا ئەبەمە بەر خوا کەلە نەزان و نەفامانبم وگاڵتەتان پێ بکەم. ﴿[٦٨] قالوا ادع لنا ربك يبين لنا ماهي﴾ ئەوجا وتیان: جا کەوایە لەپەروەردگاری خۆت داوا بکە با بۆمان ڕوون بکاتەوە ئەو مانگایە چۆن مانگایەکە و سیفەتەکانی چۆنە؟ ﴿قال إنه يقول إنها بقرة لا فارض ولا بكر﴾ مووسایش وتی: خوا ئەفەرموێ: ئەو مانگایە نەپیرێکی لە کارکەوتەیەو، نە جوانێکی کەم تەمەنە ﴿عوان بين ذلك﴾ بەڵکو ناوەنجیی ومییانەساڵە ﴿فافعلوا ما تؤمرون﴾ دەسا ئیتر ئەوەندە قووڵی مەکەنەوەو بەزوویی چیتان فەرمان پێکراوە جێبەجێی بکەن و.. کەچی هێمان بەو وەڵامەیش دڵیان ئاوی نەخواردەوە، بۆیە: ﴿[٦٩] قالوا ادع لنا ربك يبين لنا ما لونها﴾ وتیان لە پەروەردگارت بخوازە بۆمان ڕۆشن بکاتەوە ڕەنگی چۆنە؟ ﴿قال يقول إنها بقرة صفراء فاقع لونها﴾ موسا وتی: خوا ئەفەرموێ: ئەو مانگایە ڕەنگی تەواو زەردی تۆخە ﴿تسر الناظرين﴾ تەماشا کەرانی (بە سەیر کردنی) دڵخۆش دەکا. ﴿[٧٠] قالوا ادع لنا ربك يبين لنا ماهي﴾ کەچی هەرخەریکی بڕوبیانوو بون و دیسانەوە وتیان: لە پەروەردگارت داوا بکە با بەتەواوی بۆمان ڕوون بکاتەوە بزانین چۆن چۆنییە؟ ﴿إن البقر تشابه علينا﴾ بەڕاستیی ئەومانگایە لەبارەی ڕەنگ و گەورەو بچووکییەوە لێمان تێکچووە و بۆمان نادۆزرێتەوە ﴿وإنا إن شاءالله لمهتدون﴾ بەراستیی ئەگەر خوا خۆی بیەوێ ڕێنمایی دەکرێین وئەیدۆزینەوە. ﴿[٧١] قال إنه يقول إنها بقرة لا ذلول﴾ موسا وتی: خوا ئەفەرموێ: ئەو مانگایە نەڕامکراوە ﴿تثير الارض﴾ بۆ ژێر نێرو زەویی کێلان ﴿ولا تسقى الحرث﴾ ونە ئاوی کشت وکاڵیشی پێدراوە، واتە: هیچ کارێکی پێ نەکراوە ﴿مسلمة لاشية فيها﴾ یەك ڕەنگەو هیچ پەڵەی تێدانیەو زەردێکی تەواوە ﴿قالوا الآن جئت بالحق﴾ ئەوسا وتیان: وا ئێستا هەقت هێناو مەبەستەکەت خستە روو و حاڵی بووین ﴿فذبحوها﴾ ئینجا دوای ئەو سەر لێکردنەوەیە مانگایەکی ئاوایان پەیدا کردو سەریان بڕی ﴿وما كادوا يفعلون﴾ هەرچەندە نزیك بوو سەری نەبڕن (ئیبن جەریر) دەڵێ: ئەوەندە لەسەری ڕۆشتن، خوایش بەوشێوەیە بەنی توند کردنەوە.

الجُزْءُ الأَوَّلُ | سُورَةُ البَقَرَةِ

قَالُواْ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِيَ إِنَّ ٱلْبَقَرَ تَشَٰبَهَ عَلَيْنَا وَإِنَّآ
إِن شَآءَ ٱللَّهُ لَمُهْتَدُونَ ﴿٧٠﴾ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لَّا ذَلُولٌ
تُثِيرُ ٱلْأَرْضَ وَلَا تَسْقِي ٱلْحَرْثَ مُسَلَّمَةٌ لَّا شِيَةَ فِيهَا قَالُواْ
ٱلْـَٰٔنَ جِئْتَ بِٱلْحَقِّ فَذَبَحُوهَا وَمَا كَادُواْ يَفْعَلُونَ ﴿٧١﴾ وَإِذْ
قَتَلْتُمْ نَفْسًا فَٱدَّٰرَٰٔتُمْ فِيهَا وَٱللَّهُ مُخْرِجٌ مَّا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ ﴿٧٢﴾
فَقُلْنَا ٱضْرِبُوهُ بِبَعْضِهَا كَذَٰلِكَ يُحْيِ ٱللَّهُ ٱلْمَوْتَىٰ وَيُرِيكُمْ
ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٧٣﴾ ثُمَّ قَسَتْ قُلُوبُكُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ
فَهِيَ كَٱلْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً وَإِنَّ مِنَ ٱلْحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ
مِنْهُ ٱلْأَنْهَٰرُ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخْرُجُ مِنْهُ ٱلْمَآءُ وَإِنَّ
مِنْهَا لَمَا يَهْبِطُ مِنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ
الحزب ٢ ﴿٧٤﴾ ۞ أَفَتَطْمَعُونَ أَن يُؤْمِنُواْ لَكُمْ وَقَدْ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ
يَسْمَعُونَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُۥ مِنۢ بَعْدِ مَا عَقَلُوهُ
وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٧٥﴾ وَإِذَا لَقُواْ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا
وَإِذَا خَلَا بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ قَالُوٓاْ أَتُحَدِّثُونَهُم بِمَا فَتَحَ
ٱللَّهُ عَلَيْكُمْ لِيُحَآجُّوكُم بِهِۦ عِندَ رَبِّكُمْ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٧٦﴾

١١

## ڕێنماییەکانی ئایەتی (٦٧-٧١):

١) پەستیی و بەد ڕەوشتیی جوولەکەو، چەقەچەق وململانێ و زۆر وتنیان.

٢) ڕەخنە گرتن لە بڕیارەکانی خوا کاری موسڵمان نییە، دەبێ خۆت بدەی بەدەستی بڕیاریی خواوە، ئەگەرچی لە حیکمەتیشیان تێنەگەیت.

٣) ئینکاریی و خۆ دوورگرتن لە توندڕەوی لە ئەنجامدانی فەرمانەکانی خوادا، سەرەنجامی وەکو لە فەرمووده‌ی (متفق علیه)یدا هاتووەو دەفەرمویٚ: ((يَسِّرُوا ولاتُعَسِّرُوا وبَشِّرُوا ولا تُنَفِّرُوا)) وە بەهاوەڵانیشی فەرموو: ((إنما بُعِثْتُمْ مُيَسِّرِينَ ولم تُبْعَثُوا مُعَسِّرِينَ)) ترمزيی.

**کوژراوەکە زیندوو بوویەوەو، ناوی بکوژەکەی درکاند:**

﴿[٧٢] وإذ قتلتم نفسا فادارأتم فيها﴾ ئەو کاتەتان بیردیٚ، کەسێکتان کوشت و لەناو خۆتاندا کەوتنە هەوڵ وتەقەلا بۆدۆزینەوەی بکوژەکەو، لەخۆ دوورخستنەوەیی و، هاتنە لای مووساو داوای روونکردنەوەتان لێکرد؟ زاناکان دەڵێن: ئەم ئایەتە هەرچەند لەخوێندنەوەدا کەوتۆتە دوای (وإذ قال موسى لقومه إن الله يأمركم أن تذبحوا بقرة)ەوە، بەڵام لەماناو مەبەستدا، لەپێش ئەوەوەیە ﴿والله مخرج ماكنتم تكتمون﴾ جائەوەی شاردتانەوە خوای گەورە دەریخست، وەکو ئەفەرمویٚ: ﴿[٧٣] فقلنا اضربوه ببعضها﴾ پێمانگوتن پارچەیەك لەلاشەی مانگا سەربڕاوەکە لەجەستەی کوژراوەکە بدەن، ئەوسا دەستبەجیٚ کوژراوەکە زیندوو دەبێتەوەو پێتان ئەڵیٚ کیٚ کوشتوویەتی ﴿كذلك يحي الله الموتى﴾ هەر ئابەو شێوەیە خوا مردووانیش زیندوودەکاتەوە. (ئیبن کەسیر) لە (ئیبن عەباس)ـە وە دەڵیٚ: دوای جێبەجیٚ کردنی ئەوشێوەیە، دەسبەجیٚ کابراکە زیندوو بوویەوەو، دەمارەکانی لەشیشی فیشقەی خوێنیان بەست و، داستانەکەی خۆی گێڕایەوەو، ئاماژەی بەبکوژەکەی خۆی کردو گوتی: دوو ئامۆزاکەی خۆم کوشتمیان، بەڵام دوای ئەو قسەو گفتوگۆیە، نەژیاو خێرا مردەوە.

(عبدالوهاب نەجار) لەکتێبی (قصص الأنبياء)دا دەڵیٚ:مەسەلەی زیندوبوونەوەی کوژراوەکە بەو شێوەیە کە تەفسیرەکان باسی دەکەن، لەقورئان و فەرموودەکاندا هیچ دەقێکی لەسەر نەهاتووە، ئەوە بسەلمێنیٚ، بەڵکو لە درۆو دەلەسەی (بەنی ئیسرائیل) دەچیٚ و، بیٚ ونەبیٚ تێهەڵکێشی ئەوانە، کەوابوو بێدەنگ بوون لەو جۆرە قسانە باشترو لەبارترە لەگەڵ دەقی قورئانەکەدا ﴿ويريكم آياته لعلكم تعقلون﴾ خوای گەورە چەندین بەڵگەی دەسەڵاتی خۆیتان نیشان دەدات –وەك ئەم رووداوە سەرسوڕهێنەرە– تا بەڵکو تێبگەن و بیر لە دەسەڵاتی خوای گەورە بکەنەوەو باوەڕی راست ودروست بێنن. (مەراغیی) لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: بۆیە خوا لەناو گیانلەبەرانی تردا فەرمانی بەسەربڕینی مانگادا، چونکە ئەوانە گوێرەکە پەرستبوون، خوایش ئەیەویٚ هۆشیاریان بکاتەوەو، خواکەشیان پیٚ سەربڕی، تا بیرێك بکەنەوەو تێبگەن کەچۆن دەبیٚ خودا سەربڕیٚ. دەبیٚ ئەوەیش بڵێین: هەر لەبەر ئەوەش بوو کەخوای گەورە هەرلەسەرەتاوە کوژراوەکەی زیندوونەکردەوە.

**دڵڕەقیی جوولەکە:**

ئینجا دوای نیشاندانی ئەوهەموو بەڵگەو موعجیزانە، کەچی هەر سوودیان لێوەرنەگرتن، خوای گەورە پێیان دەفەرمویٚ: ﴿[٧٤] ثم قست قلوبكم من بعد ذلك فهي كالحجارة او اشد قسوة﴾ کەچی دوای ئەو هەموو موجیزانەش دڵەکانتان بوونە بەرد، بگرە لەبەرد رەقتریش، واتە: نەوەکانی یەعقووب هیچ پەندو ئامۆژگارییەکیان وەرنەگرت ! ﴿وإن من الحجارة لما يتفجر منه الأنهار﴾ بێگومان تاشە بەردی وا هەیە، بە خوڕەم و تەوژم جۆگە ئاوی لێهەڵدەقوڵیٚ ﴿وإن منها لما يشقق فيخرج منه الماء﴾ وهەندێکیشیان شەقار شەقار دەبن ودڵۆپەدڵۆپە ئاوی لیٚ دێتە دەریٚ ﴿وإن منها لما يهبط من خشية الله﴾ وهەشیانە لەترسی خوا لەچیاکانەوە بەرئەبێتەوە، کەچی دڵی ئێوەی، (بەنی ئیسرائیل) بەهیچ شتیٚ نەرم نابێت ﴿وما الله بغافل عما تعملون﴾ ئەمەش بزانن کە: هەرگیز خوا لە کاروکردەوەکانتان بیٚ ئاگاو خافڵ نیە.

## بەتەمای باوەڕ هێنانی جوولەکە مەبن:

پەیامبەرو هاوەڵانی زۆر هەوڵیان دەداو، زۆریش سووربوون لەسەر باوەڕهێنانی جوولەکە، چونکە هەردوولایان (ئەمان وئەوان) خاوەنی نامەی ئاسمانی بوون و، لەیەکترەوە نزیکبوون" ئینجا لێرەدا قورئان ئینکاری ئەو بەتەمابوونەیان دەکا ودەفەرموێ: ﴿٧٥ افتطمعون ان یؤمنوا لکم﴾ ئاخۆ ئێوە (ئەی ئیمانداران!) بە تەمان خەڵکێکی ئاوای وەك جوولەکە، بڕوا بهێنن و ئایینی ئێوە قبوڵ بکەن؟ ﴿وقد کان فریق منهم یسمعون کلام الله﴾ خۆدەستەیە کیشیان فەرمودەو قسەی خوایان بیست ﴿ثم یحرفونه من بعدما عقلوه﴾ لەپاشان دوای تێگەیشتن لێی، هەڵسان واتاو ماناکەیان گۆڕی ! ﴿وهم یعلمون﴾ دەشیانزانی لایان داوەو کارێکی هەڵەیان کردووە، بەڵام لەبەر عینادی وسەرپێچییان، کوێیان نەکردەوەو دەسبەردار نەبوون، کەوابوو هەرگیز ئێوە بە تەمای ئیمانی ئەوانە مەبن، لەولایشەوە ﴿٧٦ وإذا لقوا الذین آمنوا قالوا آمنا﴾ هەرکە بە بڕوداران دەگەن دەڵێن: ئێمە باوەڕمان هێناوە ﴿وإذا خلا بعضهم الی بعض﴾ هەرکە لەگەڵ یەکتریشدا کۆدەبنەوە ﴿قالوا اتحدثونهم بما فتح الله علیکم﴾ بە یەکتر دەڵێن: ئاخر چۆن دەبێ ئێوە ئەو قسانەی کە خوا لە تەوراتدا پێیداون و ئاگاتان لێیەتی -لەبابەت پێغەمبەر و ئیسلامەوە- لای موسڵمانەکان دەدرکێنن؟ ﴿لیحاجوکم به عند ربکم﴾ هەتا بیکەنە بەڵگە لای پەروردگارتان و، لە دواڕۆژیشدا زاڵ بن بەسەرتانا؟ ﴿افلا تعقلون﴾ ئاخۆ تاکەی تێناگەن و بیرناکەنەوە؟ واتە: راستیی ئەوپەسن و سیفەتانەی پێغەمبەر کە لەتەوراتدا هاتوون، لای موسڵمانەکان مەدرکێنن و باسیان مەکەن. ئینجا خوا لەسەر ئەو بیرو بۆچوونەیان، سەرکۆنەو سەرزەنشتیان دەکاو دەفەرموێ: ﴿٧٧ اولایعلمون ان الله یعلم ما یسرون وما یعلنون﴾ مەگەر ئەوانە کە بە یەکتر دەڵێن قسە راستەکەیان لا مەدرکێنن- نازانن کە بێگومان هەر چی لە دڵا دەیشارنەوەوهەرچیش ئاشکرای ئەکەن، خوا هەر دەیزانێ؟. پاشان دوای ئەوە دێتە سەرباسی کەرە عەوامەکانیان کە بە کوێرانە دوای زانا بەدرەفتەکانیان دەکەون وگوێ لەمشتیان دەبن، ئەفەرموێ: ﴿٧٨ ومنهم امیون لا یعلمون الکتاب﴾ جوولەکە هەیانە کەرەعەوام و نەخوێندەوارن و، هیچ نووسین و خوێندنەوەیەك نازانن ﴿إلا امانی﴾ ئەمە نەبێ کە وا دەزانن تەورات جگە لە چەند ئاوات وهیوا ئارەزوویەك کە بۆئەوان هاتووە، هیچی ترنیە، وە بەخەیاڵ لەنێو خۆیاندا دەڵێن: ترسی دوا رۆژتان نەبێ، چونکە باوەپیرانمان گشت پەیامبەربوون و، لای خوا تکامان بۆ ئەکەن و، ئەویش لێمان خۆش دەبێ..هتد ﴿وان هم إلا یظنون﴾ لەگەڵ ئەوەیشدا کە بڕوای تەواویان نیە، هەر لە ناوخەیاڵ وگوماندا دەژین، بۆیە پێیان وایە بەوجۆرە خەیاڵ و ئاواتانە رزگاریان دەبێ، مەبەست ئەوەیە کەجوولەکە خوێندەوارو نەخوێندەواریان، لای خوا یەکسانن بۆ جەزرەبەو سزادان.

الجزء الأول — سورة البقرة

أَوَلَا يَعْلَمُونَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ٧٧
وَمِنْهُمْ أُمِّيُّونَ لَا يَعْلَمُونَ ٱلْكِتَٰبَ إِلَّآ أَمَانِىَّ وَإِنْ هُمْ
إِلَّا يَظُنُّونَ ٧٨ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ يَكْتُبُونَ ٱلْكِتَٰبَ بِأَيْدِيهِمْ
ثُمَّ يَقُولُونَ هَٰذَا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ لِيَشْتَرُوا۟ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا
فَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا كَتَبَتْ أَيْدِيهِمْ وَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا يَكْسِبُونَ
٧٩ وَقَالُوا۟ لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامًا مَّعْدُودَةً قُلْ
أَتَّخَذْتُمْ عِندَ ٱللَّهِ عَهْدًا فَلَن يُخْلِفَ ٱللَّهُ عَهْدَهُۥٓ أَمْ تَقُولُونَ
عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ٨٠ بَلَىٰ مَن كَسَبَ سَيِّئَةً
وَأَحَٰطَتْ بِهِۦ خَطِيٓـَٔتُهُۥ فَأُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ
فِيهَا خَٰلِدُونَ ٨١ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ
أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ٨٢ وَإِذْ
أَخَذْنَا مِيثَٰقَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ لَا تَعْبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ
إِحْسَانًا وَذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَقُولُوا۟
لِلنَّاسِ حُسْنًا وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ ثُمَّ
تَوَلَّيْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا مِّنكُمْ وَأَنتُم مُّعْرِضُونَ ٨٣

وإذ أخذنا ١٢

**وەیل بۆ ئەوانە دەسکاری نامەی خوا دەکەن:**

بەشێکی زۆر لە جوولەکەکان نامەو تەوراتیان -لەبەرامبەر تەماحێکی دنیاوە گۆڕیی و، حەرامیان پێ حەڵاڵ کردو، حەڵاڵیان پێ حەرامکرد! ئەوجا خوای باڵادەست لە بەرامبەر ئەوکارەیانەوە ئەفەرمووی: ﴿٧٩ فويل للذين يكتبون الكتاب بأيديهم﴾ وەیل و سزای سەخت، بۆ ئەوانەیە کە بەدەستی خۆیان تەورات دەنووسنەوە ﴿ثم يقولون هذا من عند الله﴾ و پاشان دەڵێن: ئەمە لە لای خواوە هاتووە ﴿ليشتروا به ثمنا قليلا﴾ لەبەر ئەوە کەبەنرخ و بەهایەکی کەم بیفرۆشن و، کەمێك لە ماڵی دنیای پێ بەدەست بێنن! (بوخاریی) لە (ئیبن عەباس)ـە وە ئەڵێ: ئەم ئایەتە سەبارەت بە زانا کەللەپووچەکانیان هات، ئەوانەیان کە کەڕە عەوامەکانیان چەواشەو سەرلێشێواو دەکرد، چونکە بە ئارەزووی خۆیان دەستکاری (تەورات)یان دەکردو، بەوەش نەخوێندەوار و بۆرە پیاوەکانیان فریو دەداو دەستکەوتێکی ماددیشیان بۆخۆیان بەدەست دەهێنا!. جا قورئان لەبەر گەورەیی ئەو تاوانەیان دووبارە هەڕەشەیان لێدەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿فويل لهم مما كتبت أيديهم﴾ دیسانەوە هاوارو سزای سەخت بۆ ئەو دەست و قوڵبڕانەی کە تەوراتیان گۆڕی و بەدەستی خۆیان نووسییانەوە! ﴿وويل لهم مما يكسبون﴾ هاوار لەوان چە کەسابەتێکی حەرام ودزێویان بەدەست دەهێنن؟. دیسانەوە باسی سەرلێشێواوییەکی تریان دەکات کە: خۆیان بە یارو هەڵبژاردەی خوا ئەزانی ﴿٨٠ وقالوا لن تمسنا النار إلا اياما معدودة﴾ گوتیان: چەندە گوناحباربین، هەرچەند رۆژێکی ژمێرراوو کەم نەبێت لە دۆزەخدا نامێنینەوە، مەبەستیان لەو چل رۆژەیە کە گوێرەکەکەیان تێدا پەرست! ﴿قل اتخذتم عندالله عهدا﴾ ئەی موحەممەد!ﷺ پێیان بڵێ: باشە ئێوە لەخواوە هیچ پەیمانێکتان وەرگرتووە کە: تەنیا چەند رۆژێکی کەم لە دۆزەخدا ئەبن؟ ﴿فلن يخلف الله عهده﴾ هەتا خوایش پێچەوانەی بەڵێنی خۆی کار نەکا ﴿ام تقولون على الله مالا تعلمون﴾ یان هەر لە خۆتانەوە شتێکی بێبناغە بەدەم خواوە دەڵێن؟ ﴿٨١ بلى من كسب سيئة﴾ نەخێر، وانیە بەڵکو هەرکەسێك کوفرو تاوان ئەنجام بدا ﴿واحاطت به خطيئته﴾ خراپەو تاوانەکانیشی گەمارۆی دابێ ﴿فأولئك أصحاب النار﴾ ئەوانە یاوەری ئاگری دۆزخن ﴿هم فيها خالدون﴾ وەبە هەتاهەتاییش تێیدا دەمێننەوە و لێی جیا نابنەوە، ئەگەرچی خۆیشیان بەکوڕی پێغەمبەران بزانن.

رێنمایەکانی ئایەتی (٧٩-٨١):

١) خۆپاراستن لەو (فەتوا) ناهەقانەی کە لەبەردەستکەوتێکی دونیایی، حەرام حەڵاڵ دەکەن، یان بە پێچەوانەوە.

٢) نەسەب و رشتە هیچ کەڵکێ بە مرۆڤی لاسارو سەرلێشێواو ناگەیەنێ.

٣) هەمیشە دەبێ لەگوناحی گەورەو بچوك دوور بین، خۆئەگەر تووشیش بووین، پێویستە زوو بەپەلە تەوبە بکەین و کردەوەی چاکی بە دوادا بێنین.

تێبینی: هەندێ لە زانایان دەڵێن: مەبەست بەم تاوانە و (سيئة)یە، شەریك و هاوبەشدانانە بۆخوا، چونکە موشریك و هابەشدانەر، خوا لێیخۆش نابێ و، هەتا هەتایە لە دۆزەخدا دەمێنێتەوە. بەشێکی تریان ئەڵێن: مەبەست پێی هەموو جۆرە تاوانەکانی ترە، کەوابوو ئەوکاتە تاوانبارەکە -ئەر موسڵمان بێت- بەهەتاهەتایی لەوێ نابێ، بەڵکوبەپێی گوناحەکانی دەمێنێتەوەو پاشان دێتەدەر. ﴿٨٢ والذين آمنوا وعملوا الصالحات﴾ و ئەوانەیش کەبڕوایان بە خواو بەفەرمانەکانی ئەو هێناو، کردەوەی چاکیان ئەنجامدا ﴿أولئك أصحاب الجنة هم فيها خالدون﴾ ئەوانە یاوەری بەهەشتن و بۆهەتاهەتاییش تیایدا ئەمێننەوە.

**سەرنجێك:** چوونە بەهەشت بەستراوە بە ئیمان و باوەڕی تەواو و كاروكردەوەی چاكەوە، نەك بەنەسەب و نەژاد و نزیكایەتی بە پیاوچاكانەوە، ئەوەبوو كە (سوفیان) بە پەیامبەری گوت ﷺ (لەبارەی ئیسلامەوە) شتێكم نیشان بدە، كە ئیتر پێویست نەبێ لە كەسی تر پرسیاربكەم. ئەویش فەرمووی: ((قُلْ آمَنْتُ بالله فَاسْتَقِمْ)) واتە: باوەڕ بە خوا بێنەو، بەملاو بەولادا مەچۆ. موسلیم . بابی ١٢/ج٢/٤.

**جوولەكە بەڵێنیانداو هەڵیان وەشاندەوە:**

لەم چەند ئایەتەشدا هەرباسی تاوانەكانی جوولەكە دەكات كەكاتی خۆی لەگەڵ مووسادا كردیان، ئەفەرموێ: ﴿[٨٣] وإذ أخذنا ميثاق بني إسرائيل﴾ لە بیرتانە ئەوحەلە پەیمانی بەهێزو پتەومان لە كوڕان و نەوەكانی یەعقوب وەرگرت؟ ﴿لاتعبدون إلا الله﴾ كە بێجگە لەخوا نابێ هیچ شتێكیتر بپەرستن ﴿وبالوالدين إحسانا﴾ لەگەڵ باوك و دایك ﴿وذي القربى واليتامى والمساكين﴾ و خزمانی نزیك و، منداڵانی هەتیو و، خەڵكانی بێنەوا چاكە بكەن ﴿وقولوا للناس حسنا﴾ و لەگەڵ هەموو خەڵكدا قسەی چاك وباش بكەن، ڕووخۆش بن، دڵ فراوان بن، خووڕەوشتتان قەشەنگ وجوان بێ. ئیمامی (ئەحمەد) لە(ئەبو زەڕ)ەوە لە پەیامبەرەوەﷺ ئەفەرموێ: ((لا تَحْقِرَنّ من المعروف شيئا، وإنْ لَمْ تَجِدْ فالْقَ أخاك بوجهِ مُنْطَلِقٍ)). ﴿وأقيموا الصلاة وآتوا الزكاة﴾ ونوێژەكانتان بە پڕلەماناو ملكەچییەوە بكەن و، بەشێكی دیاریكراوی سامانیشتان بە زەكات بدەن ﴿ثم توليتم إلا قليلا منكم وانتم معرضون﴾ كەچی پاش ئەوە، هەمووتان -تاقمێكی كەمتان نەبێ- پشتان لەو پەیمانە كردو نافەرمان بوون. لە مەدینەدا دووتاقم جوولەكە هەبوون، جوولەكەی (بەنی قورەیزە) و (بەنی نەزیر) یەكەمیان هاوپەیمانی هۆزی (ئەوس) بوو، دووەمیشیان هاوپەیمانی هۆزی (خەزرەج)، جاكاتێ ئەو دوهۆزە جەنگیان

الجزء الأول | سورة البقرة

وَإِذۡ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَكُمۡ لَا تَسۡفِكُونَ دِمَآءَكُمۡ وَلَا تُخۡرِجُونَ
أَنفُسَكُم مِّن دِيَٰرِكُمۡ ثُمَّ أَقۡرَرۡتُمۡ وَأَنتُمۡ تَشۡهَدُونَ ٨٤
ثُمَّ أَنتُمۡ هَٰٓؤُلَآءِ تَقۡتُلُونَ أَنفُسَكُمۡ وَتُخۡرِجُونَ فَرِيقٗا
مِّنكُم مِّن دِيَٰرِهِمۡ تَظَٰهَرُونَ عَلَيۡهِم بِٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِ
وَإِن يَأۡتُوكُمۡ أُسَٰرَىٰ تُفَٰدُوهُمۡ وَهُوَ مُحَرَّمٌ عَلَيۡكُمۡ
إِخۡرَاجُهُمۡۚ أَفَتُؤۡمِنُونَ بِبَعۡضِ ٱلۡكِتَٰبِ وَتَكۡفُرُونَ
بِبَعۡضٖۚ فَمَا جَزَآءُ مَن يَفۡعَلُ ذَٰلِكَ مِنكُمۡ إِلَّا خِزۡيٞ
فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ يُرَدُّونَ إِلَىٰٓ أَشَدِّ ٱلۡعَذَابِۗ
وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ ٨٥ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشۡتَرَوُاْ
ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا بِٱلۡأٓخِرَةِۖ فَلَا يُخَفَّفُ عَنۡهُمُ ٱلۡعَذَابُ وَلَا هُمۡ
يُنصَرُونَ ٨٦ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡكِتَٰبَ وَقَفَّيۡنَا مِنۢ
بَعۡدِهِۦ بِٱلرُّسُلِۖ وَءَاتَيۡنَا عِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ ٱلۡبَيِّنَٰتِ وَأَيَّدۡنَٰهُ
بِرُوحِ ٱلۡقُدُسِۗ أَفَكُلَّمَا جَآءَكُمۡ رَسُولُۢ بِمَا لَا تَهۡوَىٰٓ أَنفُسُكُمُ
ٱسۡتَكۡبَرۡتُمۡ فَفَرِيقٗا كَذَّبۡتُمۡ وَفَرِيقٗا تَقۡتُلُونَ ٨٧ وَقَالُواْ
قُلُوبُنَا غُلۡفُۢۚ بَلۡ لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفۡرِهِمۡ فَقَلِيلٗا مَّا يُؤۡمِنُونَ ٨٨

١٣

دەبوو، جوولەكەكانیش لەگەڵ هاوپەیمانەكانی خۆیاندا دەچوونە جەنگەوە، دەرەنجام هەر جوولەكە بوو، جوولەكەی دەكوشت و سەرووماڵیشی بە تالان دەبرد.! لە(تەورات) یشدا ئەم كارە قەدەغەویاساغە، خۆ (ئەوس وخەزرەج)یش بێ باوەڕ بوون نەیاندەزانی قەبرو قیامەت چیە..! كەچی پاش كۆتایی هاتنی جەنگەكە، دەستە سەركەوتووەكە دەچوون پیتاك و(فیدیە)یان بە تاقمە شكستخواردووەكە ئەدا بۆ ئازاد كردنی دیلەكانیان بەو بیانووەوە كەگوایا (تەورات) پێیان دەڵێت ئەو فیدیەیە بدەن، لەهەمانكاتدا هەرئەو تەوراتە براكوژیشی لێ حەرام كرد بوون، كەچی بە ئارەزووی خۆیان برا كوژییان دەكردو دواتریش فیدیەیان دەدا..! جا بۆ ڕاستكردنەوەی ئەو هەڵەیە خوای گەورەو میهرەبان فەرمووی: ﴿[٨٤] وإذ اخذنا ميثاقكم لا تسفكون دماءكم﴾ ئەی لەبیرتانە پەیمانی پتەومان لێوەرگرتن كە خوێنی یەكتر بە ناحەق نەڕێژن ﴿ولا تخرجون انفسكم من دياركم﴾ و یەكتری لە جێگاو زێدو ناوچەی

خۆتـان دەرنەکـەن ﴿ثم اقررتم وانتم تشهدون﴾ پاشان بڕیارتاندا و بۆ خۆشتان شایەدبوون کـەدەبێ ئەو پەیمانە نەشکێنرێ و جێبەجێ بکرێ ﴿٨٥ ثم انتم هؤلاء تقتلون انفسکم﴾ کەچی دوای ئـەوەش ئێـوە (ئەی بەنی ئیسرائیلی سـەردەمی پێغەمبـەر) بەربوونـە گیـانی یـەکترو خۆتـان دەکوشـت ﴿و تخرجـون فریقـا منکم من دیـارهم﴾ و دەستەیەکیشتان لە ماڵ وحاڵی خۆ وەدەردەنێن ﴿تظاهرون علیهم بالإثم والعدوان﴾ و بە پشتیوانی خەڵکانێکی تر دژیان دەوەستن و دەست درێژی دەکەنە سەریان ﴿وإن یأتوکم اساری تفادوهم﴾ و کەچی ئەگەر دیلێشتان لێگرا، گشتتان (فیدیە)یان بۆئەدەن! ﴿وهو محرم علیکم إخراجهم﴾ خۆ دەکردنیشیان هەر زوو یاساغ کراوە لێتان، واتە: (کوشتن) و (دەرکردن) لە ناوچەو وڵاتدا هەردوو کارێکی حەرام و یاساغن کەچی ئێوە کوشتنەکە پشتگوێ دەخەن و بەر ئەبنە گیانی یەکتر، خۆ ئەگەر جوولەکەیەکیش دیل بکرێ گشتتان (فیدیە)ی بۆ ئـەدەن بەبیانووی ئەوە کە لە (تـەورات)دا فـەرمانتان پێکراوە، ئینجا خوای گـەورە ئەو کارە گەندەڵـەیان دەداتـە دواوەو دەفـەرموێ: ﴿افتؤمنـون ببعض الکتـاب وتکفرون ببعض﴾ باشـە! چـۆن ڕەوای هەقە باوەڕتـان بـە بەشێکی بەرنامەکـەی تـەورات هـەبێ و بە بەشێکی تری کافربن و حاشای لێبکەن؟! هەرگیز شتی وا ناگونجێت ﴿فما جزاء من یفعل ذلك منکم إلا خزی فی الحیـاة الـدنیا﴾ دیـارە هەرکەسێکتان کـارو ڕەفتـاری ئـاوا بکـاو، پـەیمانی خـۆی هەڵوەشێنێتەوە، هـەر لـەم ژیـانی دنیایـەدا ریسـواو زەلیل دەبـێ ﴿ویـوم القیامـة یـردون إلی اشـدالعذاب﴾ و لـە ڕۆژی قیامەتیشـدا بەتونـدی جەزرەبـە وسزادەدرێن ﴿وما الله بغافل عما تعملون﴾ هـەرگیز خـواش لـە هیچ کاروکردوەیـەکی ئێـوە، بـێ ئاگـاو خافـڵ نیـە. کەوابوو چۆن ئێـوە بـێ شـەرمانە ڕەفتـاری ئـاوا دەکـەن..؟! ﴿٨٦ اولئك الذین اشتروا الحیاة الدنیا بالآخرة﴾ ئەوانە کەسانێکن ژیانی قیامـەتیان بە ژیانی ئەم دنیایە داوە ﴿فلا یخفف عنهم العذاب﴾ لەبەرئەوە هیچ کات سزایان لێ سووك وکـەم ناکرێتـەوە ﴿ولاهم ینصرون﴾ لەلایـەن هیچ کەسێکیشـەوە هاوکـاریی ویارمـەتی نـادرێن، تـا لێـی بێنـە دەرێ.

**لووت بەرزیی جوولەکەو کوشتنی پێغەمبەرەکان:**

دیسـان قورئـان بـۆ جارێکی تـر ئـەو بەخششـانەی خـوا بـۆ کـوڕان و نـەوەی یـەعقووب دەخاتـە ڕوو، پاشـانیش سپڵەییان بەرامبەریان، دەفەرموێ: ﴿٨٧ ولقد آتینا موسی الکتاب﴾ سوێندبێ بەخوا، ئێمە کتێبی (تـەورات)مان دا بەمووسا ﴿وقفینا من بعده بالرسل﴾ و دوای ئـەویش پـەیتا پـەیتا پەیامبـەرانمان نارد ﴿وآتینا عیسی ابن مریم البینات﴾ وچەن بەڵگەو موجیزەیەکی ڕوونیشمان بە(عیسای کوڕی مەریم) دا تـا پەیامبـەرێتی خـۆی پـێ بسـەلمێنێ ﴿وایـدناه بـروح القـدس﴾ و بەفریشـتەی سروشیش (روح القـدس/ جبریـل) پشـتیوانیمان لێکـرد، کەچـی ئـەنجامی ناردنی ئەوهەموو پەیامبەرانە، هەر ئەمە بوو کە دەفەرموێ: ﴿افکلما جاءکم رسول بما لاتهوی انفسکم استکبرتم﴾ کـەی ئەمـە ڕاست و ڕەوایە کە هـەتا ئێسـتاش هـەر کـات پەیامبـەرێکتان بۆ هـاتبێ -کە پەیامەکـەی لەگـەڵ هـەواو ئـارەزووی ئێـوەدا نـەگونجابێ- ناڕەزاییتـان دەربڕیـوەو دەعیـەو تەکـەببورتان بەسـەریاندا کـردووەو باوەڕتـان نەهێناوە؟! ﴿ففریقا کذبتم وفریقا تقتلون﴾ ئەوساش بوونەتـە دوودەستەوە: دەستیەکتان باوەڕتـان پێنـەکردن و بە درۆتان خستنەوە، وەکو (عیساو موحەممەد) -سەلامی خوایان لەسەر بێت- دەستەیەکی تریشیانتان کوشتن، وەکو (زەکەریاو یەحیاو ئەشعیا) -سڵاوی خوایان لێ بێت-.

**تێبینی:** ناوی پیرۆزی عیسا (٢٥) جار لەقورئاندا هاتووە. ﴿٨٨ وقالوا قلوبنا غلف﴾ جولەکـەکان بە پێغەمبـەریان دەوت: دڵمان لەناو پـەردەو کالاندایـەو، هـیچ وەرنـاگرێ و لەقسەکانیشـت تێناگـەین، خـوایش لەبەرامبـەر ئـەو خـووە

ناپاکەیانەوە فەرمووی: ﴿بل لعنهم الله بکفرهم﴾ نەخێر، ئەوە نیە دەیڵێن. بەڵکو هەر لەبەر بێ باوەڕییان خوای کاردروست، لەمیهرەبانی خۆی دووری خستنەوەو نەفرینی لێکردون ﴿فقلیلا ما یؤمنون﴾ ئیتر زۆر بە کەم بڕوا دێنن.

## جوولەکە چاوەنواڕی پێغەمبەر بوون، کە هاتیش باوەڕیان پێنەکرد!

بەڵێ.. جوولەکە بەر لەهاتنی پێغەمبەر ﷺ هەڕەشەیان لەموشریکەکان دەکرد کە: بەم زوانە پێغەمبەرێ دێ و، لەژێر بەیداخی ئەودا جەنگیان لەگەڵ دەکەن، جا کەهاتیش درۆیانکردو باوەڕیان نەهێنا، بۆیە دەفەرموێ: ﴿[٨٩] ولما جاءهم کتاب من عندالله مصدق لما معهم﴾ هەرکە لەلایەن خواوە کتێبێکیان بۆهات کەپشتگیری ئایەتەکانی تەوراتیشی دەکردومژدەی بەهاتنی پێغەمبەریش دەدا ﴿وکانوا من قبل یستفتحون علی الذین کفروا﴾ بەمەرجێ بەر لەهاتنی ئەوکتێبە مژدەیان بەهاتنی دەداو دەیانویست لە ژێر بەیداخی ئەودا بەسەر بێ باوەڕاندا زاڵبین ﴿فلما جاءهم ماعرفوا کفروا به﴾ کەچی هەرکە ئەو پەیامبەرەیەهات، کەپێشتریش ئەیانناسی ولە تەوراتدا پێناسەی کرابوو، بڕوایان پێنەکردو پشتیان تێکرد ﴿فلعنة الله علی الکافرین﴾ دەسا نەحلەت ونەفرینی خوا لەسەر ئەوجوولەکە بێ باوەڕانە بێت کە باوەڕیان پێنەکرد ودرۆیانکرد ﴿[٩٠] بئسما اشتروا به انفسهم﴾ ئای بە چ بەهایەکی زۆرخراپ وکەم بەها، خۆیانیان فرۆشت ﴿ان یکفروا بما انزل الله بغیا﴾ بەرامبەر بەو قورئانە خوا ناردی کافرو بێ باوەڕ بوون وحەسوودییان برد ﴿ان ینزل الله من فضله علی من یشاء من عباده﴾ کە خوا دەرگای فەزڵی خۆی لە هەرعەبدێك لە بەندەکانی خۆی بکاتەوەو فەرمانی خۆی پێ بسپێرێ ﴿فباءو بغضب علی غضب﴾ دەرەنجام دووجار تووشی ڕق وخەشمی خوای گەورەبوون" خەشم لەسەر بێ باوەڕییان بە پەیامبەر ﷺ و خەشمێکیش لەسەر گۆڕینی تەورات" ﴿وللکافرین عذاب مهین﴾ دیارە بۆئەو بێ باوەڕانە سزایەکی سەرسوڕهێنەرو ریسواکەر هەیە ﴿[٩١] وإذا قیل لهم آمنوا بما انزل الله﴾ هەرکە پێیان بگوترێ: وەرن بەوبەرنامەیەکە خوا ناردوویەتی باوەڕبهێنن ﴿قالوا نؤمن بما انزل علینا﴾ دەڵێن: هەرچی بۆخۆمان هاتووە باوەڕی پێدەکەین ، واتە: تەنها بە تەورات بڕوا دێنین ﴿ویکفرون بما وراءه وهو الحق مصدقا لما معهم﴾ ئیتر جگە لەو باوەڕ بەهیچ کتێبێکی تر ناکەن ، هەر چەندە پشتگیریی لە کتێبەکەی خۆشیان بکات، واتە: قورئان و ئینجیل ناسەلمێنن، لەحاڵێکدا کە هەرئەو(قورئانە)ش ڕاست ودروستە وتەوراتەکەی ئەوانیش دەچەسپێنێ ﴿قل فلم تقتلون انبیاء الله من قبل إن کنتم مؤمنین﴾ پێیان بڵێ: باشە! ئەگەر بە کتێبەکەی خۆتان بڕواتان هەیە، ئەی بۆچی لەوەوبەر پەیامبەرەکانی خواتانکوشت، ئەگەر ڕاست ئەکەن بڕوادارن..؟! واتە: بڕوای وا ڕاست نیە ئەگەرنا

الجزء الأول | سورة البقرة

وَلَمَّا جَآءَهُمۡ كِتَٰبٞ مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٞ لِّمَا مَعَهُمۡ وَكَانُواْ
مِن قَبۡلُ يَسۡتَفۡتِحُونَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَلَمَّا جَآءَهُم
مَّا عَرَفُواْ كَفَرُواْ بِهِۦۚ فَلَعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٨٩﴾
بِئۡسَمَا ٱشۡتَرَوۡاْ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمۡ أَن يَكۡفُرُواْ بِمَآ أَنزَلَ
ٱللَّهُ بَغۡيًا أَن يُنَزِّلَ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦۖ
فَبَآءُو بِغَضَبٍ عَلَىٰ غَضَبٖۚ وَلِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٞ مُّهِينٞ
﴿٩٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ ءَامِنُواْ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُواْ نُؤۡمِنُ بِمَآ
أُنزِلَ عَلَيۡنَا وَيَكۡفُرُونَ بِمَا وَرَآءَهُۥ وَهُوَ ٱلۡحَقُّ مُصَدِّقٗا
لِّمَا مَعَهُمۡۗ قُلۡ فَلِمَ تَقۡتُلُونَ أَنۢبِيَآءَ ٱللَّهِ مِن قَبۡلُ إِن كُنتُم
مُّؤۡمِنِينَ ﴿٩١﴾ ۞ وَلَقَدۡ جَآءَكُم مُّوسَىٰ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ
ثُمَّ ٱتَّخَذۡتُمُ ٱلۡعِجۡلَ مِنۢ بَعۡدِهِۦ وَأَنتُمۡ ظَٰلِمُونَ ﴿٩٢﴾
وَإِذۡ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَكُمۡ وَرَفَعۡنَا فَوۡقَكُمُ ٱلطُّورَ خُذُواْ
مَآ ءَاتَيۡنَٰكُم بِقُوَّةٖ وَٱسۡمَعُواْۖ قَالُواْ سَمِعۡنَا وَعَصَيۡنَا
وَأُشۡرِبُواْ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلۡعِجۡلَ بِكُفۡرِهِمۡۚ قُلۡ
بِئۡسَمَا يَأۡمُرُكُم بِهِۦٓ إِيمَٰنُكُمۡ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿٩٣﴾

١٤ | قُلۡ إِن

پەیامبەرەکانتان نەدەکوشت ﴿٩٢ ولقد جاءکم موسی بالبینات﴾ سوێند بە خوا مووساش بەڵگەو موجیزەی زۆری بۆ هێنان وهاتە لاتان ﴿ثم اتخذتم العجل من بعده وانتم ظالمون﴾ کەچی پاش ئەوە-کە بەدەعوەتی خوا- چوو بۆ کێوی توور، ئێوە گوێرەکەتان پەرست و کردتانە خوای خۆتان و بەوەش ستەمتان لە خۆتانکرد.

**جوولەکە پاش پە یماندان و، راگرتنی کێوی (توور) بەسەریانەوە، یاخیی بوون:**

لێرەدا بۆ جارێکی تر هەندێ لە سەرپێچیەکانیان بە ڕوویاندا دەداتەوە، تابەڵکو تەمێ خواردبن بۆیە دەفەرموێ: ﴿٩٣ وإذ اخذنا میثاقکم ورفعنا فوقکم الطور﴾ لە بیرتانە پەیمانێکی بەهێزو پتەومان لێ وەرگرتن کە بە تەورات کار بکەن، کێوی (توور)یشمان بەسەرتانەوە ڕاگرت و پێمانگوتن: ﴿خذوا ما آتیناکم بقوة واسمعوا﴾



هەرفەرمانێکمان پێداون لە(تەورات)دا، دەبێ زۆر بەتوند بیگرن وبیبیستن و گوێڕایەڵی بن ، واتە: بەوردی کردارو ڕەفتاری پێ بکەن ﴿قالوا سمعنا وعصینا﴾ کەچی گوتیان: بەڵێ بیستمان و، گوێڕایەڵیش نابین ..! ﴿وأشربوا فی قلوبهم العجل بکفرهم﴾ ئەوینی گوێرەکە پەرستیی، تێکەڵی دڵ ودەرونیان ببوو، چونکە کافر بوون وباوەڕیان لەبیر چوویەوە ﴿قل بئسما یأمرکم به إیمانکم إن کنتم مؤمنین﴾ ئەی موحەممەد! ﷺ بڵێ : ئەگەر بڕواداربن، بێ شک بڕواکەتان تووشی شتی زۆر خراپ و ناڕەوای کردون. ئینجا ڕووبەڕوویان دەوەستێ و دەفەرموێ: ﴿٩٤ قل إن کانت لکم الدار الآخرة عند الله خالصة من دون الناس﴾ ئەی موحەممەد!ﷺ پێیان بڵێ: ئەگەر ڕاست دەکەن و باوەڕتان وایە کە لەخواوە نزیکن و، ماڵی ئەودنیاش هەرتایبەتە بە ئێوەوەو" بەشی کەسی تری تێدانیە" وەك خۆتان ئەڵێن" ﴿فتمنوا الموت إن کنتم صادقین﴾ جائەگەر ئەوە ڕاستە، دەسا داوای مردن بکەن، تازوو بچنە بەهەشتەوە" بەلام دیارە قورئان سروشتیان ئەناسێ و ئەزانێ کە درۆ ئەکەن

بۆیە پێیان دەفەرمووێ: ﴿٩٥ ولن یتمنوه ابدا بما قدمت ایدیهم﴾ بەهۆی ئەوکاروکردەوە نادروستەیانەوە ، پێشی خۆیانیان خستوون ، هەرگیز داواو ئارەزووی مردن ناکەن، ﴿والله علیم بالظالمین﴾ وخواش بە ستەمکاران -خۆیان و نەفسیەتیان-چاك زاناو بەئاگایە ﴿٩٦ ولتجدنهم أحرص الناس علی حیاة ومن الذین اشرکوا﴾ سویندبێ بە خوا، تۆ دەبینی کەجوولەکە لەهەڵپە بۆ ژیانی ئەم دنیایە ، لەتەواوی مەردم، بگرە لەو کەسانەش شەریك بۆخوا دادەنێن، سوورترو تامەزرۆ ترن ! کەوابوو درۆ دەکەن کە دەڵێن ئێمە گەلێکی کەم تەمەعین ﴿یود أحدهم لو یعمر الف سنة﴾ هەر کام لەوانە ئاواتەخوازە و پێیخۆشەکە: هەزار ساڵ تەمەنی هەبێ وبژی! ﴿وما هو بمزحزحه من العذاب أن یعمر﴾ خۆئەر ئەو تەمەنە درێژەشی بدرێتێ ،-کاتێ مردو گەڕایەوە لای خوا- بەوتەمەنە درێژەی لە سزای خوا

دوور ناخرێتەوەو ڕزگار نابێ ﴿والله بصير بما يعملون﴾ وخواش بەو کاروکردەوە ئەوان دەیکەن زۆر بینایە ، کەوابوو ئیتر ئێوە هەرگیز ناتوانن هیچ شتێکی لێ بشارنەوەو درۆی لەگەڵدا بکەن.

**جوولەکە جبریل بەدوژمنی خۆیان دەزانن!:**

پێشەوا (ئەحمەد) لە(ئیبن عەبباس)ـەوە –خوا لێیان رازیی بێ– دەڵێ: تاقمێ لەجوولەکە ڕوویان لە پێغەمبەرﷺکردو وتیان: ئەبەلقاسم! ئێمە پێنج شت لە تۆ دەپرسین، جائەگەر تۆ وەڵامتداینەوە، ئەوا باوەڕدەکەین تۆ پێغەمبەریت و، پەیڕەویشت لێدەکەین، ئەوجا وەك (ئیسرائیل/ یاقووب) بەڵێنی لەکوڕەکانی خۆی وەرگرت، لەبارەی (یوسف)ـەوە ﷺ بەڵێنیان داو گوتیان: (الله علی مانقول وکیل) پێغەمبەریش ﷺ هەروا بەڵێنی دانێ و بۆی دوویات کردنەوەو، فەرمووی: دەسا پرسیارەکانتان بڵێن: ئەوانیش وتیان: نیشانەی پێغەمبەرێتی چییە؟ فەرمووی: ((تَنامُ عَيْنَاهُ، وَلا يَنَامُ قَلْبُهُ)) واتە: پێغەمبەر هەردووچاوی دەنوێن ، بەڵام هەرگیز دڵی نانوێ ولەخوا خافڵ نابێ" وتیان: ئەی ئەو تنۆکە ئاوە کە دەچێتە منداڵدانەوە" چۆن جارێ دەبێتە مێینە، .جارێکیش دەبێتە نێرینە؟ فەرمووی: ((يَلْتَقِي الماءانِ، فإذا علا ماءُ الرجلِ ماءَ المرأةِ أذْكَرَتْ، وإذا علا ماءُ المرأةِ ماءَ الرجلِ أُنْثتْ)) واتە: کەهەردوو ئاوەکە لەجێی خویاندا بەیەك دەگەن ، ئەگەرئاوی پیاوەکە سەرکەوت بەسەرئاوی ژنەکەدا ، ئەوە کوڕی دەبێ و، خۆ ئەرئاوی ژنەکە سەرکەوت بەسە ئاوی پیاوەکەدا، ئەوا کچی دەبێ. وتیان: دەباشە! یەعقوب چ شتێکی لە خۆی قەدەغە کرد؟ فەرمووی: ((كانَ يَشْتَكي عَرْقَ النَّسا لايَجِدُ شَيْئا يُلائِمُهُ إلا ألْبانَ كَذا وَ كَذا)) واتە: کاتی خۆی یاقووب ﷺ تووشی (عەرقوننەسا)بوو، بێجگە لە شیری (وشتر)یش شتێکی تری بۆباش نەبوو، ئەوجا لەبەرئەوە کە وشترەکە بمێنێتەوەو سەرنەبڕدرێ، گۆشتەکەی لەخۆی حەرامکرد، وتیان: راستە، دەکەیت. وتیان باشە ئەی ئەو (ڕەعد) ودەنگە لە هەورەکانەوە دێت چیە..؟ لەوەڵامدا فەرمووی: ((مَلَكٌ من ملائكةِ الله (عزوجل) مُوَكَّلٌ بِالسَحاب، بِيَدِهِ مِخْراقٌ مِن نار يَزْجُرُ بِهِ السَحابَ، يَسُوقُه حيثُ أمَرَ اللهُ)) خوا فریشتەیەکیهەیە" کاروباری گشت هەورەکانی پێ سپێردراوە، ئەو (ڕەعد) وبروسکەیش ئێوە دەیبینن و دەیبسن، دەنگ و نەعرەتەی فریشتەکەیە. وتیان: راست دەکەیت، بەڵام تەنیا پرسیارێکمان ماوە، ئەگەر بەراستیی وەڵامیمان بدەیتەوە، ئەوا پەیمان و بەیعەتت دەدەینێ وباوەرت پێدێنین، پرسیارەکەیش ئەمەیە: هەر پێغەمبەرێك فریشتەیەکی وەحی هاتۆتە لایی و وەحی بۆهێناوە، باشە ئەو فریشتەیەی وەحیی بۆتۆ دێنی کێیە؟ فەرمووی: (جوبریل)ـە ﷺ وتیان: جوبریل! ئەوجوبریلە کە دەستووری جەنگ وکوشت و کوشتار دەدا ؟! خۆ ئەوە دوژمنی ئێمەیە، ئەگەر لەباتی ئەوە گوتبات میکائیلە کە ڕەحمەت وباران و سەوزایی دێنێ، قبووڵمان بوو، ئەوسا خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوەو فەرمووی: ﴿[97] قل من كان عدوا لجبريل فإنه نزله على قلبك بإذن الله﴾ ئەی موحەممەد!ﷺ پێیان بڵێ: هەرکە سێك خۆی بە دوژمنی جوبریل دەزانێ، دەبا لە خەم وخەفەتدا بمرێ، چونکە بێگومان ئەوە بەفەرمانی خوا ئەم قورئانەی دابەزاندووە بۆسەر دڵ ودەروونی تۆ، ئیتر با جوولەکە هەر ڕقیان لێبێ و دوژمنایەتی لەگەڵ بکەن، وەك خۆیان هاوار ئەکەن و ئەڵێن: جوبریل دوژمنی ئێمەیە..؟! ﴿مصدقا لما بين يديه﴾ ئەو قورئانەش ئەودەیهێنێ ،پشتگیری لە کتێبەکانی بەردەستی دەکا، بەتەوراتەکەی ئەوانیشەوە ﴿وهدى وبشرى للمؤمنين﴾ وەرێنمایی وموژدەیشە بۆ بڕواداران، کەوابوو بڕوا نەبوونی ئەوانە بەقورئان ئەر هەر لەبەر ئەوە بێ کە جوبریل هێناویەتی، ئەوە شتێکی زۆرخراپ ونارەوا و ناماقوڵە. ﴿[98] من كان عدوا لله وملائكته ورسله وجبريل وميكال﴾ هەرکەسێك دژمنی خواو فریشتەو پەیامبەرەکانی ئەووجوبریل ومیکائیل بێت، ئەوەبێ سۆ کافرو بێ باوەڕە ﴿فإن الله عدو للكافرين﴾

لەبەرامبەر ئەوەیشەوە، بێگومان خوا ناحەزو دوژمنی بێ باوەڕانەو، مامەڵەی دوژمنایەتیان لەگەڵ دەکات، چونکە هەرکەسێك دوژمنایەتیی لەگەڵ دۆستەکانی خوادا بکا، وەك دوژمنایەتی لەگەڵ خودی خوادا کردبێ وایە.

**بەڵگەی پێغەمبەرێتی موحەممەد ﷺ:**

﴿[٩٩] ولقد انزلنا إليك آيات بينات﴾ سوێند بێ بەخوا ئەی موحەممەد ﷺ ئێمە بەڵگەو نیشانەیەکی زۆرو ئاشکرامان بۆناردویت، بۆ سەلماندنی راستیی پەیامبەرێتیت ﴿وما يكفر بها إلا الفاسقون﴾ خۆمەگەر هەر فاسق ولەسنووردەرچووەکان حاشاو نکوولی لێ بکەن ﴿[١٠٠] او كلما عاهدوا عهدا نبذه فريق منهم﴾ مەگەر بۆچی جوولەکە هەرجارێ بەڵێن وپەیمانێك دەدەن بەخوا خێرا دەستەیەکیان پشتگوێی دەخەن و هەڵیدەوەشێننەوە؟ ﴿بل اكثرهم لايؤمنون﴾ بۆیە وایش ئەکەن، چونکە زۆربەی زۆرینەیان بڕوای پێ ناهێنن، ئیتر چۆن پەیمان دەبەنەسەر، (مالیکی کوڕی صەیف)ی جوولەکە، هەر کەپێغەمبەر هات ، سوێندی خوارد کە: خوا سەبارەت بەو پێغەمبەرە، هیچ پەیمانێکی لێ وەرنەگرتوون! ﴿[١٠١] ولما جاءهم رسول من عندالله﴾ دیسان دوای ئەوەش کەخوا ئەم پێغەمبەرەی ناردەلایان ﴿مصدق لما معهم﴾ و پشتگیری لەتەوراتەکەشیان دەکا ﴿نبذ فريق من الذين أوتوا الكتاب كتاب الله وراء ظهورهم﴾ دەستەیەك لەخاوەن کتێب و نامەکان، کتێب و نامەکانی خوایان پشتگوێ خست و خۆیانیان لێ بێ ئاگاکرد، واتە: لەبەرئەوەی کە کتێبی تەورات پەسنی پێغەمبەری تێدابووە، لەگەڵ قورئاندا یەکیان دەگرت، زاناکان ئەویشیان فڕێدایە پشتەوە! بۆیە دەفەرموێ: ﴿كأنهم لا يعلمون﴾ هەردەڵێیت هەواڵ و نیشانەی وایان لەتەوراتدا نەزانیوە جا هەر بەوەیشەوە نەوەستان، بەڵکو بەجادوو و شتی واوە خۆیان سەرقاڵکرد وگوتیان: کاتی خۆیشی (سولەیمان) هەر بە جادووگەریی و سیحر، دەسەڵاتەکەی خۆی ڕاگرتبوو..! بۆیە خوا بەدرۆی خستنەوە.

الجزء الأول | سورة البقرة

وَاتَّبَعُوا۟ مَا تَتْلُوا۟ ٱلشَّيَـٰطِينُ عَلَىٰ مُلْكِ سُلَيْمَـٰنَ ۖ وَمَا كَفَرَ
سُلَيْمَـٰنُ وَلَـٰكِنَّ ٱلشَّيَـٰطِينَ كَفَرُوا۟ يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ
ٱلسِّحْرَ وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَـٰرُوتَ وَمَـٰرُوتَ ۚ
وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَآ إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ ۖ
فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَزَوْجِهِۦ ۚ
وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِۦ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ وَيَتَعَلَّمُونَ
مَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ ۚ وَلَقَدْ عَلِمُوا۟ لَمَنِ ٱشْتَرَىٰهُ
مَا لَهُۥ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ مِنْ خَلَـٰقٍ ۚ وَلَبِئْسَ مَا شَرَوْا۟ بِهِۦٓ
أَنفُسَهُمْ ۚ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿١٠٢﴾ وَلَوْ أَنَّهُمْ ءَامَنُوا۟
وَٱتَّقَوْا۟ لَمَثُوبَةٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ خَيْرٌ ۖ لَّوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ
﴿١٠٣﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَقُولُوا۟ رَٰعِنَا وَقُولُوا۟
ٱنظُرْنَا وَٱسْمَعُوا۟ ۗ وَلِلْكَـٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٠٤﴾
مَّا يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ وَلَا ٱلْمُشْرِكِينَ
أَن يُنَزَّلَ عَلَيْكُم مِّنْ خَيْرٍ مِّن رَّبِّكُمْ ۗ وَٱللَّهُ يَخْتَصُّ
بِرَحْمَتِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴿١٠٥﴾

١٦ | مَا نَنسَخْ مِنْ

**سەر گوزەشتەکەی ( هاروت ) و ( ماروت ):**

﴿[١٠٢] واتبعوا ما تتلوا الشياطين على ملك سليمان﴾ هەندێ لە نەوەکانی (یاقووب) کەوتنە شوێنی ئەوجادووە کە شەیاتینی لەسەردەمی پاشایەتی ودەسەڵاتی سولەیماندا عليه السلام دایان هێناو دەیانخوێند، واتە: کەوتنە شوێنی ئەوفڕوفێڵانەی دەربارەی حکومەتەکەی سولەیمان دەیانکرد ﴿وما كفر سليمان﴾ خۆ ئاشکرایشە کەسولەیمان کافرو جادووگەر نەبوو و ئەویش "جادووی دانەهێنا" وەك ئەوان دەڵێن ﴿ولكن الشياطين كفروا﴾ بەڵکو شایەتینەکان جادوویان داهێناو کافرو بێ بڕوا بوون و لەسنوور دەرچوون ﴿يعلمون الناس السحر﴾ و خەڵکیشیان فێری جادوو دەکرد ﴿وما أنزل على الملكين ببابل هاروت وماروت﴾ هەروەها کەوتنە شوێنی ئەو زانیاریی و

زانستیەی هاتبوویە سەر ئەو دوو فریشتەیە "هاروت وماروت" لە "بابل"ی عێراقدا. لەوسەردەمەدا مەردم زۆر سەرقاڵبوون بە جادوو و فروفێڵ لەگەڵ یەکتردا، جا لەوکاتەدا خوای گەورە ئەودوو فریشتەی نارد تا جادوویان بۆ ڕوون بکەنەوەو خەڵکی تێبگاو بەهەڵە نەچن و بزانن کە جادوو لەگەڵ موعجیزەی پەیامبەرێتیدا دووشتی لێکجیاوازن، وە لەهەمان کاتیشدا ئەو دوو فریشتەیە بەخەڵکەکەیان دەوت: ئێمە تەنها مایەی تاقیکردنەوەین وهاتووین بۆ بەتاڵکردنەوەو هەڵوەشانەوەی سیحر، دەخیل سەددەخیل ئێوە نەفێری ببن و، نە ڕەفتاریشی پێ بکەن، بەڵێ.. کاری ئەو دو فریشتەیە هەر ئەمە بوو، ئیتر لەمە بەولاوە شتێکی تر نەبوو، هەرچەندە بەداخەوە قسەی زۆر – تەنانەتی بەدەم ئیبن وعەباسەوە– دەربارەیان دەگێڕنەوە! ﴿وما يعلمان من أحد حتى يقولا إنما نحن فتنة فلا تكفر﴾ وە لەهەمان کاتدا هەر کەسێکیان فێری جادوو دەکرد لە سەرەتاوە پێیان دەگوت: ئەم کارەی ئێمە تەنها بۆ تاقیکردنەوەو فێر بوونی جیاکردنەوەی (موعجیزە) و(سیحرە) و لەلایەن خواوە نێردراوین، کەوابوو ئاگادار بە! خۆت کافر مەکە و فێری جادوو نەبیت ﴿فيتعلمون منهما ما يفرقون به بين المرء وزوجه﴾ بەڵام هەندێك هەر کوڵیان نەدا تالەو دوو فریشتەوە فێری ئەمە بوون کەبتوانن بەسیحر ژن ومێرد لێکبکەنەوە، واتە: مەردمەکە بەگوێی فریشتەکانیان نەکردو، فێری جادوو بوون وپاشان جادووو سیحریان لەیەك دەکردو، جۆرەها کاری ناپەسەندو ناشەرعییان ئەنجام دەدا، هەرچەند ﴿وما هم بضارين به من أحد إلا بإذن الله﴾ بەبڕیاری خوا نەبووبا ئەو جادووگەرانە توانایان نەبوو زیانێك بەهیچ کەسێ بگەیەنن ﴿ويتعلمون ما يضرهم ولا ينفعهم﴾ هەر فێری شتێ ئەبوون کە زیانیان لێ بداو، هیچ قازانج وسوودێکی نەبێ بۆیان ﴿ولقد علموا لمن اشتراه ماله في الآخرة من خلاق﴾ کە ئەوکارە ناپەسەندەشیان ئەکرد، وە نەبێ لەڕووی نەزانینەوە بێت، بەڵکو ئەو(جولەکانە) چاك دەشیانزانی ئەوکەسەی کڕیاری جادووگەریی بێ، لەڕۆژی دواییدا هیچ کەڵك وسوودێکی پێ ناگاو لەبەهرەی خوا بێ بەشە، ئەوسا بۆئەوەی پتر لەسیحر تێبگەین چەند ئایەتێك وهاوڕێ لەتەك کورتە ڕاڤەیەکی جادوودا باس دەکەین، جا ئەمانە هەندێك لەو ئایەتانەن کە لەبارەی (سیحر)ـەوە هاتوون،: (ولكن الشياطين كفروا يعلمون الناس السحر) (بەقەرە:١٠٢)، (فلما جاء السحرة) (یوونس:٨٠)، (وجاء بسحر عظيم) (ئەعراف:١١٦).

## زانایان دەربارەی بوون و حەقیقەت و ڕاستیی سیحر، چەند قسەیەکیان هەیە:

١– هەندێکیان دەڵێن: سیحر شتێکەو حەقیقەتێکی هەیە، دەشتوانێ بەواقیعی و بەبەرچاوی بینەرەوە ڕۆڵی خۆی ببینێ و، بۆیشی هەیە لەحاڵەتێکەوە بۆحاڵەتێکی دی هەرشتێ بگۆڕێ.

٢– هەندێکی دی پێچەوانەی ڕای ئەوانەن، وەك ئیمامی (ئیبن جەریر) –ڕەحمەتی خوای لێ بێ– کەدەڵێ: ناڕێکی و جیاوازی لەپێناسە کردنی (سیحر)دا زۆر زۆرە، هەندێك لەزانایان دەڵێن: سیحر کۆمەڵێك فرۆفێل و چەواشەگەری و خیدعەیە ساحیر بەسەلیقەی خۆی وادەکا لە سیحرلێکراوەکە، تا وابزانێ کە ئەوەی ئەیکات حەقیقەتەو بنەڕەتێکی هەیە، وەك کەسێك لە دوورەوە(سەراب) تراویلکەیەك دەبینێ و بۆخۆی وادەزانێ ئاوە، کەچی کاتێك لێی نزیك دەبێتەوە، ئەوجا دەزانێ ئاو نیە. هەندێکیدی ئەڵێن: ساحیر دەتوانێ تەنانەت ئینسانیش بکاتە گوێدرێژ!!، یان ئینسان و گوێدرێژ بگۆڕێ بەشتێکی دی، دواتریش زانای پایەبەرز (لالەکائی) ئەڵێ: ئەگەر نەیتوانیبا ئەم جۆرە شتانە بکات، هەرگیز نەیشیدەتوانی جیاوازی بخاتە نێوان ژن و مێردەوە" کەوابوو دەشتوانێ چۆلەکە بکات بە مرۆڤ یا.. هتد (ئیبن قەیم)یش ڕەحمەتی خوای لێبێ لەتەفسیری سوورەتی (فلق) دەڵێ: ئەم ئایەتەی: (ومن شر النفاثات في العقد) ئەو فەرموودەیەش خاتوو عائیشە– ڕەزای خوای لێبێ– دەگێڕێتەوەکە:

سیحر لەپێغەمبەری خوا ﷺ کرا، ئەمانە هەردووکیان بەڵگەن لەسەر ئەوەکە سیحر هەیەو راستە. بەهەرحاڵ ئەهلی (تەفسیر) و(حەدیس) هەردوولا ئەڵێن: ئەو ریوایەتانەی کەلە هاوەڵان و سەلەفەوە هاتوون بەڵگەن لەسەر ئەوە کە سیحر حقیقەتی هەیە، وە ئەو ئایەتەش کە خوای گەورە دەفەرموێ: (فیتعلمون منهما ما یفرقون به بین المرء وزوجه) دیسانەوە هەرئەوە دەسەلمێنێ کە سیحر لە تێکدانی پەیوەندی ژن ومێردا کاریگەریی خۆی هەیەو، وە بێجگە لەمانەش فەرمودەی راست ودروستیش هەیە کەپێغەمبەری خواﷺ سیحری لێکراوە. جەماوەری زانایانیش لەسەر ئەوەن کە: سیحر کاریگەریی خۆی هەیە. بۆ نموونە ئیمامی نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێبی) لەشەرحی (موسلیم)دا ئەڵێ: (والصحیح أن له حقیقة وبه قطع الجمهور وعلیه عامة العلماء، ویدل علیه الکتاب والسنة المشهورة)، بەڵام هەر (نەوەوی) خۆی دەڵێ: ئەو ڕاو بۆچوونە کە دەڵێ: ساحیر دەتوانێ ئینسان بگۆڕێ بە غەیری خۆی لەواقیعەوە زۆر دوورە، ئیتر خوای گەورەیش باشتر دەزانێ. (ئیبن حەزم)یش -رەحمەتی خوای لێبێ- دەڵێ: (وذهب أهل الحق إلی أنه لا یقلب أحد عینا ولا یحیل طبیعة إلا الله عزوجل لأنبیائه فقط). (ئیبن حەجەر) یش- رەحمەتی خوای لێبێ- دەڵێ: شتێ کە جێگەی قسەو باس بێت ئەوەیە کە ئایا ساحیر دەتوانێ شتێك لەحاڵەتێکەوە بۆحاڵەتێکی دیکە بگۆڕێ ؟ پاشان ئەڵێ: جەماوەری زانیان لەسەر ئەوەن کە سیحر راستەو حەقیقەتێکی هەیەو کاریگەریی خۆیشی هەیە، بەڵام ناتوانێ هیچ شتێك لەحاڵەتێکەوە بۆ حاڵەتێکی دی بگۆڕێ، خوایش باشتر دەزانێ. دەبێ ئەوەش بزانین کە سیحر یەکێکە لە گوناهە زۆر گەورەکان و دەبێ مۆسڵمان زۆر خۆی لێ بپارێزێ، هەروەکو لە (صەحیح)ـی موسلیم و بوخاریی)دا هاتووە، وەئیمامی (عومەرو، ئیمامی عوسمان و، جندوب و، خاتوو عایشەو، خاتوو حەفصە)یش- خوایان لێ ڕازی بێ- لەسەر ئەوەن کە دەبێساحیر بکوژرێ. لەکتێبەکەی ئیمامی (ترمزی)یشدا هاتووە کە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((حد الساحر ضربة بالسیف)) جا ئەم حەدیسە هەرچەندە (ضعیف الإسناد)ە، بەڵام ئیمامی (زەهەبی) دەڵێ: (والصحیح انه موقوف علی جندب بن عبدالله). سەبارەت بە حوکمی ساحیریش ئیمامی (ئەحمەد) و ئیمامی (مالیك) - رەحمەتی خوایان لێ بێ- دەڵێن: دەبێ ساحیر بکوژرێ، بەڵام ئیمامی ئەحمەد ئەم قسەیەش دەکاو دەڵێ: ئەگەر ساحیرە کە لە (أهل الذمة) بوو، ئەوە ناکوژرێ، بەڵگەشی ئەو فەرموودە صەحیحەیە کە (لبید بن الأعصم)ـی یەهوودی سیحری لە پێغەمبەری خوا کردوﷺ نەشیکوشت، بەڵام ئیمامی شافیعیی و ئیمامی ئەبو حەنیفە- رەحمەتی خوایان لێبێ- دەڵێن: ساحیر ناکوژرێت، جا لەهەر میللەتێك بێت (أهل الذمة) بێ یان نا.. بەڵگەشیان ئەوەیە کەپێغەمبەر ﷺ کاتێ ساحیرەکە سیحری لێکرد نەیکوشت، خوایش باشتر ئەزانێت. منیش دەڵێم: حوکمەکە دەدرێتە دەستی ئەمیرو رابەری دەستەی زانایانی سەردەم، ئەگەر ئەوان کوشتنیان پێ باش بوو، ئەوە دەکوژرێ، ئەگینا ئازاد دەکرێ (والله أعلم).

﴿ولبئس ماشروا به أنفسهم لوکانوا یعلمون﴾ بەڕاستیی ئەگەر تێگەیشتبان ئەوشتەی کە ئەوان خۆیانیان پێ فرۆشت، دەیانزانی چ کارێکی زۆر خراپ و ناپەسەند بوو.

## ڕێنمایەکانی ئایەتی (١٠٢

١) دژایەتی قورئان وسوننەت، لەبەرئەوە کەکاری خراپ و فەسادو ستەمکارییان حەرامکردووە، سەرە ڕای کافر بوون، دەرگای هەموو باتڵ و دزێوییەکیش لە مرۆڤ دەکاتەوەو، قورئانیان لا بچوك دەبێتەوە، پەنا بەیاسا دەستکردەکان ئەبەن و، بازاڕی بیدعە چییەکان گەرم دەکەن و، بەخۆشیان نازانن چ دەکەن؟!.

٢) گشت قازانج وزیانێك هەر بەدەستی خوایە.

٣) فێربوونی سیحرو بەکار هێنانی هەردوو کارێکی حەرامن، وەك (ئەبو حەنیفە، مالیك، ئەحمەد) -خوا لێیان رازی بێ- ئەڵێن، بەڵام هەندێ لەهاوڕێیانی ئەبوحەنیفە ئەڵێن: فێربوونی سیحر بۆ خۆپارستن، نەحەرامە و، نەکوفرە.

﴿[١٠٣] ولو أنهم آمنوا واتقوا﴾ خۆئەر ئەو جوولەکانە بڕوایان بەبەرنامەکەی خوا هەبا- وەك پێویست- وەلەسزایشی پارێزیان کردبا ﴿لمثوبة من عند الله خير﴾ دەیانزانی کە پاداشتێك لەلای خوایە باشترە بۆیان ،لەو قازانجە دنیاییەی چاوەڕوانیان ئەکرد ﴿لو كانوا يعلمون﴾ ئەگەر بیانزانیباو، زانستی ژیرانەیان بخستایەتە کار.

تێبینی: لەو سەردەمەدا جادووگەرێکی زۆر پەیدابببوو، جادووگەرەکانیش کاری زۆر سەرسوڕهێنەریان دەکرد و، زۆر کەسیش وایدەزانی ئەوکارەی ئەوان موجیزەیەو خۆیشیان پەیامبەرن، جا لەبەرئەوە خوای بالادەس ئەو دوو فریشتەی ناردو جۆری جادووەکەی فێر کردن، تا بتوانن جادوو موعجیزە لێك جیاکەنەوەو بزانن ئەوانەی کەداوای پەیامبەرێتی ئەکەن بێ بەڵگەیەکی زانستانەو باوەڕپێکراو، کارێکی زۆر ناپەسەند ئەکەن و جادووبازن، نەك پەیامبەر.

## وشەی جوان و ناسك بڵێن:

لێرەدا دیسانەوە تاوانێکی تری جوولەکە روون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿[١٠٤] ياأيهاالذين آمنوا لا تقولوا راعنا﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! لەکاتی قسەکردن لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ مەڵێن (راعنا) بەومانایە کەگوایە باش گوێ بیستمان بە، تائێمە مەبەستی خۆمانت پێ رادەگەیەنین و تۆش وەریگریت، چونکە وشەی ((راعنا)) هەر لەووشەیە دەچێت کەجوولەکە بۆمانای بەدکاروخراپ لای خۆیان بەکاری دەهێنن، چونکە بەزمانی عیبریی جوولەکە (راعنو) واتە: ئەی بەدکارو ساویلکە! دیارە مەبەستی ئەوان بەو وشەیە گاڵتەو لاقرتیکردنە بەپەیامبەر ﷺ، جا لەبەرئەوە کە (راعنا) نزیکە لە وشەی (راعِنو)وەو، (راعِنو)ش لەزمانی ئەواندا بەمانای مرۆڤی زۆر ساویلکەو خراپە، نابێ ئێوە (ئەی موسڵمانان!) بەکاری بهێنن ﴿وقولوا انظرنا واسمعوا﴾ وەلەباتی بڵێن (راعنا) بڵێن (انظرنا)، چونکە ئەم وشەیە تەنها مانای مۆڵەت خواستن و چاوەنۆڕێ دەبەخشێ، وەك خوا ئەفەرموێ: (وقولوا انظرنا واسمعوا) بڵێن: تەماشامان بکەو، هۆشت پێمانەوە بێت، ئێوەش گوێی بدەنێ و وتەکانی ببیسن، واتە: ئێوە وەك ئەوان مەبن کە دەڵێن: (سمعنا و عصينا) ﴿وللكافرين عذاب اليم﴾ بۆئەو بێباوەڕانە سزایەکی ئێش پێگەیەنەر هەیەو ئامادەیە .(ئیبن کەسیر)دەڵێ: لەم ئایەتەدا خوای گەورە موسڵمانان قەدەغە دەکات، کە لە قسەوگوتارو رەفتاردا، خۆ بە کافرانەوە بشوبهێنن، وە سەبارەت بە فەرموودەی: ((مَنْ تَشَبَّهَ بِقَوْمٍ فَهُوَ مِنْهُمْ)) دەڵێ: ئەمە ئەوپەڕ هەڕەشەیە لەو کەسانە کەلە جەژن و قسەو گوتارو جل وبەرگ و باری کۆمەڵایەتیدا، خۆ دەشوبهێنن بەخوانەناس و کافرانەوە. ئای کاشکا! ئەمڕۆ موسڵمانان کەمێك هۆشیار دەبوونەوەو ئەوەندە بەدوای لاسایی داب و نەریت و مۆدەبازی بێگانە نەدەکەوتن و نەدەچوونە ژێر پەرچەمی ئەم و ئەوی دژ بە دین و وڵات و نیشتمانمانەوە ﴿[١٠٥] ما يود الذين كفروا من أهل الكتاب ولا المشركين أن ينزل عليكم من خير من ربكم﴾ خاوەن نامە بێ باوەڕەکان، ئەوانەی دینی خۆیان لە دەسداو، ئەوانەش موشریکن و هاوبەش بۆ خوا دادەنێن، قەت پێیان خۆش نیە لە لایەن پەروەردگارتانەوە، هیچ خێرو بێرێکتان بۆبێت، چ جای ئەوەی پێیان خۆشبێت، قورئانتان بەدیاریی و خەڵات بۆ بێت ﴿والله يختص برحمته من يشاء﴾ و خواش مەیلی خۆیەتی، هەرکەس خۆی حەزبکا رەحمەت و سۆزی خۆی بۆ تایبەت دەکاو دەیکاتە پێغەمبەر ﴿والله ذو الفضل العظيم﴾ و دیارە خوا خاوەنی فەزڵ و بەخششی زۆر گەورەیە.

## نەسخ و لەكارخستن لە قورئاندا:

جوولەكەو هاوەڵدارەكان دەیانگوت: سەیری موحەممەد ناكەن چۆن ئەمڕۆ شتێك ئەڵێ و، سبەینێ شتێكی تر؟! خوای گەورە لەوەڵامیاندا فەرمووی: ﴿١٠٦ ماننسخ من آیة او ننسها﴾ ئێمە لەقورئاندا هەر ئایەتێك بسڕینەوەو لەكاری بخەین، یان فەرامۆشی بكەین و لەبیری ببەینەوە ﴿نأت بخیر منها او مثلها﴾ ئێمە لەباتی ئەوە، ئایەتێكی چاكتر و ئاسانتر" یان هەروەكو ئەو دەخەینە جێی" تا لەپاشە ڕۆژدا ببێ بەمایەی پاداشتی گەورە تروزیاتر"(تەبەریی) بۆ لەكارخستنی ئایەتەكان وگۆڕینیان، چەند نموونەیەك دێنێتەوە:

الجزء الأول — سورة البقرة

۞ مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَآ أَوْ مِثْلِهَآ
أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٠٦﴾ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ
مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن
وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿١٠٧﴾ أَمْ تُرِيدُونَ أَن تَسْـَٔلُوا۟ رَسُولَكُمْ
كَمَا سُئِلَ مُوسَىٰ مِن قَبْلُ وَمَن يَتَبَدَّلِ ٱلْكُفْرَ بِٱلْإِيمَٰنِ
فَقَدْ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴿١٠٨﴾ وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ
ٱلْكِتَٰبِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّنۢ بَعْدِ إِيمَٰنِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا
مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْحَقُّ فَٱعْفُوا۟
وَٱصْفَحُوا۟ حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ
﴿١٠٩﴾ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَمَا تُقَدِّمُوا۟ لِأَنفُسِكُم
مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِندَ ٱللَّهِ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ
﴿١١٠﴾ وَقَالُوا۟ لَن يَدْخُلَ ٱلْجَنَّةَ إِلَّا مَن كَانَ هُودًا أَوْ نَصَٰرَىٰ
تِلْكَ أَمَانِيُّهُمْ قُلْ هَاتُوا۟ بُرْهَٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ
صَٰدِقِينَ ﴿١١١﴾ بَلَىٰ مَنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ
فَلَهُۥٓ أَجْرُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿١١٢﴾

١٧

یەكەم: گۆڕینی قورس بۆئاسان، وەك لابردن وسڕینەوەی شەونوێژ لەسەر موسڵمانان. دووەم: گۆڕینی ئاسان بۆقورس، وەك گۆڕینی چەند ڕۆژێ ڕۆژوو- كەلەسەرەتاوە هەبوو- بۆ ڕۆژووی مانگێكی ڕەبەق، ئەمە هەرچەندە قورسترە، بەڵام لەرووی پاداشتەوە گەورەترو باشترە. سێیەم: گۆڕین وسڕینەوەی بڕیارێك بۆ بڕیارێكی تر وەكو خۆی، وەك گۆڕینی رووگە لە (بیت المقدس)ـەوە بۆ(كەعبە). خوای گەورە سەیری بەرژەوەندی خەڵكی خۆی دەكا،چاك دەزانێت كەئەمڕۆ بڕیارێك زۆر لەبارو گونجاوە، بەڵام بۆسبەینێ نەگونجاوە، ئەوسائەویش بە فەزڵی خۆی ئەیسڕێتەوە، چونكە: ﴿الم تعلم ان الله علی كل شیء قدیر﴾ مەگەر نەتزانیوە كە خوای گەورە بەسەر هەموو شتێكدا بەتواناو دەسەڵاتدارەو هەرچیش بكات ئەیكات، ئەمڕۆ بڕیارێكە، بۆ سبەینێ، بڕیارێكی ترە ﴿١٠٧ الم تعلم ان الله له ملك السموات والأرض﴾ ئایا نەتانزاینوە كە بێ سۆ دەسەڵاتدارێتی وموڵكایەتی گشت ئاسمانەكان و زەوی هەر بۆخوایە؟ ﴿وما لكم من دون الله من ولی ولا نصیر﴾ ودیارە بێجگە لەخواش، هیچ یاوەرو كۆمەك كارێكتان نیە، بێ بەهاوارو هاناتانەوە. ئەم مەسەلەی (نەسخ) و سڕینەوەیە، لەكۆنەوە بۆتە هەراو كێشەی ناو زانایان و، كتێب ونووسراوی زۆریان تێدا نووسیوەو، هەر یەكە بەباری ڕاو بۆچوونی خۆیدا رایدەكێشێ و، پەسەندی دەكات، ئەگەرچی لەكتێبەكانی خۆماندا دەڵێ: جەماوەری زانایان لەسەر ئەوەن كە: نەسخ لە(ئەوامیرو نەهیدا هەیە، قورتبیی دەڵێ: (انكرت طوائف من المنتمین للإسلام المتأخرین جوازه وهم محجوجون بإجماع السلف علی وقوعه فی الشریعة الإسلامیة).

## پرسیاری بێ جێ و ناشایست مه‌كه‌ن:

﴿[١٠٨] أم تريدون أن تسئلوا رسولكم كما سئل موسى من قبل﴾ ئه‌ی یاران وهاوه‌ڵان! مه‌گه‌ر ئێوه‌یش ئه‌تانه‌وێ داوای چه‌ند به‌ڵگه‌و موعجیزه‌یه‌كی گه‌وره له‌په‌یامبه‌ره‌كه‌تان (موحه‌ممه‌دﷺ) بكه‌ن سه‌ره‌ڕای ئه‌و هه‌موو به‌ڵگانه‌ی بۆتان هاتن هه‌روه‌ك له‌مه‌وبه‌ر له‌لایه‌ن به‌نی ئیسرائیله‌وه داوا له‌مووسا كرا! كه‌چی ئه‌وانه‌ی لای مووسا عليه السلام هێشتا دوای ئه‌و هه‌موو به‌ڵگانه بۆی هێنان گوتیان (أرنا الله جهرة)! جابۆئه‌وه له‌وجۆره خووه‌ناڕێكه بیانترسێنێ خوای گه‌وره ئه‌فه‌رموێ: ﴿ومن يتبدل الكفر بالإيمان﴾ جاهه‌ركه‌سێك كوفر به‌ئیمان بگۆڕێته‌وه‌و، دین وباوه‌ڕی راستی خۆی، بدا به‌بێ ئاینی ﴿فقد ضل سواء السبيل﴾ بێگومان ئه‌وه ڕێگای راست و دروستی لێونبووه‌و،سه‌ر لێشێواوه،خوای گه‌وره‌له جێگایه‌كی تردا ده‌فه‌رموێ: (ياأيها الذين آمنوا لاتسئلوا عن أشياء إن تبد لكم تسؤكم وإن تسئلوا عنها حين ينزل القرآن تبد لكم والله غفور حليم)، پێغه‌مبه‌ریشﷺ ده‌فه‌رموێ: ((ذروني ماتركتكم..)) موسلیم.﴿[١٠٩] ودّ كثير من اهل الكتاب لو يردّونكم من بعد إيمانكم كفارا حسدا من عند أنفسهم﴾ زۆرێك له‌خاوه‌ننامه‌كان – له‌به‌رحه‌سوودیی وناپاكیی خۆیان– پێیان خۆشه دوای بڕواهێنانتان، كافرتان بكه‌نه‌وه ﴿من بعد ماتبين لهم الحق﴾ پاش ئه‌وه‌ی كه هه‌ق و ڕاستیان به‌ته‌واوی بۆ ڕوون بوویه‌وه‌و زانییان كه: موحه‌ممه‌د ﷺ پێغه‌مبه‌ری خوایه. (ئوسامه‌ی كوڕی زه‌ید) ئه‌ڵێ: جارێك پێغه‌مبه‌ر ﷺ سواری گوێدرێژێك ببوو (عه‌بدوڵڵای كوڕی ئوبه)یش، ته‌نزو ته‌شه‌رێكی لێدا، پێغه‌مبه‌ریش به‌(سه‌عدی) گوت: گوێت لێبوو چی گوت؟! سه‌عدیش پێیگوت: بیبه‌خشه‌و قسه‌كه‌ی پشتگوێ بخه، پێغه‌مبه‌ریش ﷺ- كه‌هه‌رده‌م كاری لێبووردنه- به‌خشیی، ئه‌و جا ئه‌م ئایه‌ته هات وفه‌رمووی: ﴿فاعفوا واصفحوا حتى يأتي الله بأمره﴾ واته ئێوه لێیان ببوورن و، چاوپۆشییان لێ بكه‌ن، تا فه‌رمان وبڕیاری خوا به سه‌ركه‌وتن و رزگاربوون دێت ﴿إن الله على كل شئ قدير﴾ به ڕاستیی خوا به‌سه‌ر هه‌مووشتێكدا تواناو ده‌سه‌ڵاتداره. ئینجا یه‌ك دووهۆی سه‌ركه‌وتن بۆموسڵمانان باس ده‌كا وئه‌فه‌رموێ: ﴿[١١٠] وأقيموا الصلاة وآتوا الزكاة﴾ به‌رده‌وام نوێژه‌كانتان به‌رێك وپێكی بكه‌ن و كه‌مته‌رخه‌مییان تیا مه‌كه‌ن و، زه‌كاتیش بده‌ن به‌وانه‌ی پێیان ده‌شێ ﴿وما تقدموا لأنفسكم من خير تجدوه عندالله﴾ وه هه‌ركارێكی خێرو چاكه، بۆئه‌و لاتانی پێش بخه‌ن، پاداشته‌كه‌یتان لای خوا پێده‌گاته‌وه‌و ون نابێت، وه‌ك خوای گه‌وره له‌جێگای تردا ئه‌فه‌رموێ: (فمن يعمل مثقال ذرة خيراً يره..) وه بۆ خۆ دورخستنه‌وه‌یان له گوناهو نافه‌رمانی ئه‌فه‌رموێ: ﴿إن الله بما تعملون بصير﴾ به‌ڕاستیی خوا به‌گشت كاروكرده‌تان بینایه‌و، چاودێری كرداروكۆششتانه.

## پڕو پاگه‌نده‌ی جووله‌كه!

هه‌میسان قورئانی پیرۆز، پڕوپاڵانته‌یه‌كی تری جووله‌كه‌كان باس ده‌كاو ده‌فه‌رموێ: ﴿[١١١] وقالوا لن يدخل الجنة إلا من كان هودا أو نصارى﴾ جووله‌كه گوتیان: هیچ كه‌سێ –بێجگه له‌جووله‌كه– ناچێته به‌هه‌شته‌وه، گاوره‌كانیش هه‌ر به‌وجۆره گوتیان: نه‌ساراو عیسایی نه‌بێت ، كه‌سێ تر ناڕواته به‌هه‌شته‌وه! دیاره به‌رده‌وام هه‌ردوولا هه‌وڵیان ده‌دا یه‌كتر به‌درۆبخه‌نه‌وه‌و، به‌هه‌شت بۆخۆیان قۆرخ بكه‌ن! ﴿تلك أمانيهم﴾ ئه‌م قسه‌و باسانه به‌هه‌میشه ئاوات و خه‌یاڵ پلاوییانه.

﴿قل هاتوا برهانكم إن كنتم صادقين﴾ تۆش پێیان بڵێ: دەسا ئەگەر ڕاست بێژن لە بۆچوونەکانتاندا، بەڵگەکانتان بهێنن ﴿١١٢ بلى من اسلم وجهه لله﴾ بەڵێ.. ڕاستیەکەی ئەمەیە کە: هەکەرسێك بەچاکی و بێخەوش، خۆی بەدەست خواوە دابێ و، ڕووی هەرلە خوابێ و، لە فەرمانەکانی سەرپێچی نەکا ﴿وهو محسن﴾ وە لەهەمانکاتدا چاکە خوازیش بێت ﴿فله أجره عند ربه﴾ ئەوەپاداشتی لای پەروەردگاری خۆی وەردەگرێ ومسۆگەرە ﴿ولا خوف عليهم ولاهم يحزنون﴾ ونەترس و بیمێکیان دەبێت لەقیامەتدا، نە غەم و خەفەتیش دەخۆن بۆ دنیا. شەڕە قسەی مووسایی وعیسایی: دەستەیەك لەهەردوولا، تەنها خۆیان بەڕاست و دروست دەزانی! جابۆ دەمکوت کردنیان، خوا دەفەرموێ: ﴿١١٣ وقالت اليهود ليست النصارى على شئ﴾ جوولەکە دەیانگوت: مەسیحی وگاورەکان لەسەر هیچ بنەماو ئاینێکی بڕوا پێکراو نین و هیچکارەن ﴿وقالت النصارى ليست اليهود على شئ﴾ وە گاورەکانیش دەیان گوت: جوولەکە ناهەقن و لەسەر هیچ بنەماو ڕاستییەك نین ﴿وهم يتلون الكتاب﴾ بەمەرجێ کە هەردوولاشیان کتێب و نامەی ئاسمانی دەخوێننەوە، جوولەکە (تەورات)، ئەمانیش (ئینجیل) کە هەردووکیان قسەو باسی ڕاست و باشیان تیایە، کەچی لەگەڵ ئەوەیشدا یەکتریان بەکافرو بێ باوەڕ دادەنا ﴿كذلك قال الذين لا يعلمون مثل قولهم﴾ خۆ ئەوانەیش کەهیچ نەزانن وەك ئەوانەی کە تەنها مادەیان بەلاوە شتە، هەر وەکو ئەوانە دەڵێن و قسە دەکەن و، باوەڕیان بەهیچ ئاینێکی ئاسمانیی نیەو بێ پەردەش دەڵێن: ((الدين أفيون الشعوب/ ئاین تریاکی گەلانە!) ﴿فالله يحكم بينهم يوم القيامة فيما كانوا فيه يختلفون﴾ ئەوسا سەبارەت بەو ئیختیلاف و مشت و مڕەو کێشەیانە خوا لە ڕۆژی قیامەتدا دادگاییان دەکات و، بڕیاری دروست دەدات، تا دەرکەوێ، ئاخۆ جوولەکە ڕاستە، یان فەلە؟ ئەوکاتە خۆیان دەبیننەوە.

الجزء الأول سورة البقرة

وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ لَيْسَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ عَلَىٰ شَيْءٍ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ
لَيْسَتِ ٱلْيَهُودُ عَلَىٰ شَيْءٍ وَهُمْ يَتْلُونَ ٱلْكِتَٰبَ كَذَٰلِكَ قَالَ
ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ مِثْلَ قَوْلِهِمْ فَٱللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ
فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿١١٣﴾ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن مَّنَعَ مَسَٰجِدَ
ٱللَّهِ أَن يُذْكَرَ فِيهَا ٱسْمُهُۥ وَسَعَىٰ فِى خَرَابِهَآ أُو۟لَٰٓئِكَ مَا كَانَ
لَهُمْ أَن يَدْخُلُوهَآ إِلَّا خَآئِفِينَ لَهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا خِزْىٌ
وَلَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١١٤﴾ وَلِلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ
فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا۟ فَثَمَّ وَجْهُ ٱللَّهِ إِنَّ ٱللَّهَ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿١١٥﴾
وَقَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدًا سُبْحَٰنَهُۥ بَل لَّهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلْأَرْضِ كُلٌّ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ ﴿١١٦﴾ بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ
وَإِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿١١٧﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ
لَا يَعْلَمُونَ لَوْلَا يُكَلِّمُنَا ٱللَّهُ أَوْ تَأْتِينَآ ءَايَةٌ كَذَٰلِكَ
قَالَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِم مِّثْلَ قَوْلِهِمْ تَشَٰبَهَتْ قُلُوبُهُمْ
قَدْ بَيَّنَّا ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴿١١٨﴾ إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ
بِٱلْحَقِّ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَلَا تُسْـَٔلُ عَنْ أَصْحَٰبِ ٱلْجَحِيمِ ﴿١١٩﴾

١٨ ولن ترضى

### داخستنی مزگەوتەکان لەیادی خوا:

﴿١١٤ ومن أظلم ممن منع مساجد الله ان يذكر فيها اسمه﴾ دەبێ کێ لەوکەسە ستەمکارترو تاوانبارتر بێ، ڕێگە نەدا لەمزگەوتەکاندا یادی خوا بکرێ ﴿وسعى فى خرابها﴾ وبۆ وێرانکردنیشیان، تێبکۆشێ و، نەهێڵێ خوا پەرستییان تێدا بکرێ، یان هەر بیانڕووخێنێ، وەك کۆمۆنیستەکان، کە تەنها لە (سەمەرقەند)دا چواردە هەزار مزگەوتیان لەناوی پیرۆزی خوا داخست! ڕۆمانەکانیش دوای (٧٠) ساڵ لە بەرزکردنەوەی عیسا ﷺ بۆ ئاسمان، چوونە (بيت المقدس)ـەوەو بەردیان لەسەربەرد نەهێشت، تەنانەتی پەیکەرەکەی (سولەیمان)یشیان ڕووخاند! ﴿أولئك ماكان لهم أن يدخلوها إلا خائفين﴾ ئەوانە هەر نەدەبوو بشچنە ناو مزگەوتەکانەوە، بەترس و بیمەوە نەبێت،

واتە: لەباتی ئەوە کەئەوان ئەمڕۆ ئاوا بەمزگەوتەکان بکەن، دەبوو موسڵمانان ڕیسوایان بکەن وملیان پێدانەوێنن، چ جای ئەوە کە بتوانن مزگەوتەکان بروخێنن؟! بۆیە پێغەمبەرﷺ پاش ئازادکردنی مەککە، فەرمانی دا کە ساڵی ئایندە نابێ کافرو موشریک حەج بکەن و بێنەماڵی خواوە: ((ألا لايحجن بعد العام مشرك، ولا يطوفن بالبيت عريان، ومن كان له أجل فأجله إلى مدته)) فتح الباري. ﴿لهم في الدنيا خزي ولهم في الآخرة عذاب عظيم﴾ بەشی ئەوانە لەدنیادا هەر ڕیسوایی و بەدناوییە، لە پاشەڕۆژیشدا تووشی سزایەکی گەورەو گران دەبن.

## لە نوێژدا ڕوو بکەرە ڕووگە:

﴿[١١٥] ولله المشرق والمغرب فأينما تولوا فثم وجه الله﴾ خۆرهەلات و، خۆرئاوای دنیا، هەرهی خوایەو، خۆی خاوەنیانە، جاکەوابوو لە نوێژەکاندا ڕوو لە هەرجێگایەك بکەن، ڕووگەیەو خوا لەوێیەو ڕووی لێتانە. لەوە دەچێ وەك ئیمامی (موسلیم) ئەڵێ ئەم بڕیارە پێش دیاریکردنی ڕووگەبووبێ، لەولاشەوە ئەو بۆچوونەی ئەوانی پووچەڵکردەوە کە گوایا تەنها لە(دێر) و (کەنیسە)کاندا خواپەرستیی ئەکرێ..! ﴿إن الله واسع عليم﴾ بێگومان زانستی خوا بەربڵاو و فراوانەو، لەهەموو شتێکیش بەئاگایە، خۆی چاك دەزانێ چۆن نەخشەی کارەکانی خۆی بکێشێ. جاکەوابوو ئەگەر ئەوان مزگەوتەکانیان لێ داخستن، ئێوە لە هە رجێگایەکی تردا دەتوانن نوێژەکانتان بکەن، چونکە گشت ئەملاو ئەولاکانی زەوی، بۆ ئێوە مزگەوتە.

### ڕێنمایەکانی ئایەتی (١١٤-١١٥):

١) دەرکردنی خەڵکی لە مزگەوتەکان، تاوانێکی زۆر گەورەیە.

٢) دەبێ مزگەوتەکان لەکافران بپارێزرێن و، قبوولیش نەکرێ بچنە نێویەوە، مەگەر موسڵمانان خۆیان ڕێگا بدەن ورازی بن.

٣) نوێژی سوننەت بەسەر وڵاخەوە -ڕووت لە ڕووگەوە بێ، یا نە- ڕەوایە.

٤) نوێژ خوێنی فەرز، هەتا دەکرێ دەبێ ڕووی لە ڕووگەوەبێ، مەگەر کاتێ کەنەخۆش بێ و نەتوانێ ڕووی تێ بکا، وەیان کاتێ ترسی هەبێ، وەیا جەنگاوەر بێ و دوژمن لە ڕووی قیبلەوە بێ، یا لە دەس دوژمن هەڵهاتبێ، یا نەزانێ قیبلە لە کوێوەیە تا ڕووی تێبکا.

## خوا کەی منداڵی هەیە؟!

جوولەکە دەیانگوت: (عوزەیر) کوڕی خوایە! (نەسارا)یش دەیانگوت: عیسا! هاوبەشدانەرانیش: فریشتەیان بە کچی خوا دادەنا..!! بۆیە خوا فەرمووی: ﴿[١١٦] وقالوا اتخذ الله ولدا﴾ هەرسێ لایەنەکە دەیانگوت: خوا منداڵی بۆخۆی ڕاگرتووە ﴿سبحانه﴾ خوا لەوشتانە پاك وخاوێن وبێخەوشە، ئاخر چۆن دەگونجێ منداڵی ببێ؟! ﴿بل له مافي السموات والأرض﴾ نەخێر، بەڵکو هەرچی لەئاسمانەکان و زەویدایە- بە عوزێر و عیساو فریشتەیشەوە- هەموو موڵکی خوان ﴿كل له قانتون﴾ وە هەر هەمووشیان ملکەچی فەرمان و ئیرادەو ویستی ئەون جا ئیتر بۆچی پێویستی بەوانەیە؟ ﴿[١١٧] بديع السموات والأرض﴾ بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوییە ﴿وإذا قضى أمرا فإنما يقول له كن فيكون﴾ هەر کەویستیشی فەرمان وبڕیارێ بدا، تەنها دەفەرموێ: ببە، ئەویش دەست بەجێ دەبێ. لەپێشەوە ئەوانەی دەمکوتکرد کە ددانیان بە تاك وتەنیایی خوادا نەدەنا، ئێستاش ڕوو لەوانە دەکا کە لەبارەی پەیامبەرێتی پەیامبەرەوە ململانێ دەکەن: ﴿[١١٨] وقال الذين لايعلمون﴾ ئەوانەی وا بێ ئاگاو هیچ نەزانبوون- نامەیان نەبوو و، پەیڕەوی هیچ پەیامبەرێکیشیان نەدەکرد- دەیانگوت: ﴿لولا يكلمنا الله﴾ باشە! بۆچی خوا ڕوبەڕوو قسەمان

له‌گه‌ڵ ناکاو پێمان ناڵێت که‌تۆ په‌یامبه‌ریت؟! ﴿او تأتینا آیة﴾ یان بۆ پشتگیری تۆ، به‌ڵگه‌و موعجیزه‌یه‌کمان بۆنایه‌؟!
﴿کذلك قال الذین من قبلهم مثل قولهم﴾ خۆ ئه‌وانه‌یش به‌رله‌وان بوون ، هه‌رهه‌مان قسه‌یان ده‌کرد ﴿تشابهت قلوبهم﴾
له‌ ئینکاری وململانێ و دوان له‌ شانی قورئان وپه‌یامبه‌ردا، دڵیان چوونیه‌که و له‌یه‌ك ده‌چێ. به‌ڵێ له‌هه‌موو
سه‌ده‌یه‌کدا کۆمه‌ڵه خه‌ڵکێکی گه‌وج وگێل، سه‌ری ژه‌هراویان ده‌بزوێنن و، زۆر بێ شه‌رمانه ئه‌و جۆره قسانه ده‌که‌ن
! ﴿قدبینا الآیات لقوم یوقنون﴾ خۆ به‌راستی ئێمه به‌ڵگه‌و موعجیزه‌کانی خۆمانمان روونکردۆوه وکه‌ڵکی ده‌بێ بۆ
خه‌ڵکێکی یه‌قیندار، دیاره ئه‌وانه چونکه دڵیان نه‌خۆشه‌و، به‌گومان ودوودڵن، به‌هیچ به‌ڵگه‌یه‌ك قایه‌لنابن و به‌هره
وه‌رناگرن ﴿[119] إنا ارسلنا بالحق بشیرا ونذیرا﴾ ئێمه تۆمان به‌ڕاست و ره‌وان نارد ئه‌ی موحه‌ممه‌د! ﷺ که: مژده به
خه‌ڵکانی ئیماندارو ئاکارچاك بده‌یت، مه‌ردمی کافروبێ
باوه‌ڕیش له‌قاری خوابترسێنیت ﴿ولا تسأل عن اصحاب
الجحیم﴾ وئیتر پاش ئه‌وه ده‌رباره‌ی دۆزه‌خیه‌کان،تۆ
باپرسنیت، واته: ئه‌وانه‌ی ئه‌وجۆره وتانه ئه‌درکێنن
،ئه‌هلی دۆزه‌خن و، هیچ کاتیش ڕزگاریان نابێ لێی.

الجزء الأول — سورة البقرة

وَلَن تَرْضَىٰ عَنكَ ٱلْيَهُودُ وَلَا ٱلنَّصَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ ۗ قُلْ إِنَّ
هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلْهُدَىٰ ۗ وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم بَعْدَ ٱلَّذِى جَآءَكَ
مِنَ ٱلْعِلْمِ ۙ مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿١٢٠﴾ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ
ٱلْكِتَٰبَ يَتْلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ أُو۟لَٰٓئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ۗ وَمَن يَكْفُرْ بِهِۦ
فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿١٢١﴾ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتِىَ ٱلَّتِىٓ
أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ وَأَنِّى فَضَّلْتُكُمْ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٢٢﴾ وَٱتَّقُوا۟ يَوْمًا
لَّا تَجْزِى نَفْسٌ عَن نَّفْسٍ شَيْـًٔا وَلَا يُقْبَلُ مِنْهَا عَدْلٌ وَلَا تَنفَعُهَا
شَفَٰعَةٌ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿١٢٣﴾ ۞ وَإِذِ ٱبْتَلَىٰٓ إِبْرَٰهِۦمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَٰتٍ
فَأَتَمَّهُنَّ ۖ قَالَ إِنِّى جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا ۖ قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِى ۖ قَالَ لَا
يَنَالُ عَهْدِى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٢٤﴾ وَإِذْ جَعَلْنَا ٱلْبَيْتَ مَثَابَةً لِّلنَّاسِ
وَأَمْنًا وَٱتَّخِذُوا۟ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِۦمَ مُصَلًّى ۖ وَعَهِدْنَآ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِۦمَ
وَإِسْمَٰعِيلَ أَن طَهِّرَا بَيْتِىَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلْعَٰكِفِينَ وَٱلرُّكَّعِ
ٱلسُّجُودِ ﴿١٢٥﴾ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِۦمُ رَبِّ ٱجْعَلْ هَٰذَا بَلَدًا ءَامِنًا وَٱرْزُقْ
أَهْلَهُۥ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ مَنْ ءَامَنَ مِنْهُم بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ۖ قَالَ وَمَن كَفَرَ
فَأُمَتِّعُهُۥ قَلِيلًا ثُمَّ أَضْطَرُّهُۥٓ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلنَّارِ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٢٦﴾

١٩

**هه‌تا نه‌چیته سه‌ر دینی مووسایی وعیسایی، لێت رازیی نابن:**

﴿[120] ولن ترضی عنك الیهود ولاالنصاری﴾ هه‌رگیز ئه‌م
جووله‌که‌و فه‌لانه له تۆخۆشیان نایه (ئه‌ی موحه‌ممه‌دﷺ!
﴿حتی تتبع ملتهم﴾ هه‌تا په‌یڕه‌وی له ئایین وبه‌رنامه‌یان
ده‌که‌یت، واته: هه‌تا نه‌چیته سه‌ر دینی ئه‌وان هه‌رگیز
به‌ته‌مای ره‌زامه‌ندی ئه‌وان مه‌به‌و، باوه‌ڕیش ناهێنن و،
له‌پیلان وئاژاوه گێڕیی وفه‌سادو، خراپه‌کاری کۆتا ناکه‌ن
﴿قل إن هدی الله هو الهدی﴾ ده‌سا ئه‌ی په‌یامبه‌ر ﷺ! پێیان
بڵێ: بێگومان ڕێی راست ودروست، هه‌ر ئه‌م به‌رنامه‌و
ڕێبازه‌ی خوایه، واته: هه‌ر قورئان وڕێنماییه‌کانی ئه‌و،
راسته ڕێ و ڕێ نیشانده‌ره، نه‌ك ڕێبازو کوێره ڕێگاکانی تر
که‌ئێوه‌و هاوکاره‌کانی ئێوه‌ی له‌سه‌ره، پێغه‌مبه‌ریش ﷺ ده‌یفه‌رموو: ((لاتَزالُ طائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِی یُقاتِلُونَ علی الْحَقّ،
لایَضُرُّهُمْ مَنْ خَالَفَهُمْ حَتّی یَأْتِیَ أَمْرُ اللهِ)) موسلیم. ﴿ولئن اتبعت أهواءهم﴾ سوێند بێ به‌خوا ئه‌گه‌ر په‌یڕه‌وی له
هه‌واو ئاره‌زووی ئه‌وان بکه‌یت و بچیته سه‌ر کرده‌و وته‌یان ﴿بعدالذی جاءك من العلم﴾ دوای ئه‌وه‌که زانست و
زانیاریت بۆهاتووو، یه‌قینت هه‌یه که ته‌نها قورئان و دینی (ئیسلام) راست و ره‌وایه ﴿مالك من الله من ولی ولانصیر﴾
ئیتر چاك بزانه که بێ شك هیچ سه‌رپه‌رست وچاودێرو کۆمه‌ککارێکت له خواوه بۆنابێ. له‌هه‌موو سه‌رده‌مێکدا
جووله‌که‌و گاور- هه‌رچه‌ند ناوبه‌ناو له‌ناوخۆشیاندا نارێکبووبن- به‌ڵام بۆ پێشێلکردنی ئاینی ئیسلام و لاوازکردنی
په‌یامه‌که‌ی خوا، یه‌کیان گرتووه‌و هه‌رله هه‌وڵدا بوون، دیاره هه‌ر جاره‌ش به‌شێوازێك خه‌ریکبوون، بۆیه خوای
گه‌وره به‌م ئایه‌ته باوه‌ڕداران ئاگادار ده‌کاته‌وه که ئه‌وانه نه‌تانخه‌ڵه‌تێنن و نه‌چنه سه‌ر ئایینه‌که‌یان و وریای

پیلانەکانیان بن ﴿[١٢١] الذین آتیناهم الکتاب یتلونه حق تلاوته﴾ ئەوانەیان کە کتێب ونامەمان پێدان -تەورات و ئینجیل- و بە راست و دروستیش دەوری دەکەنەوەو دەیخوێنن و، کاری پێدەکەن ﴿اولئك یؤمنون به﴾ دیارە ئەمانەیان باوەڕی تەواویان پێی هەیە و، لای خوا پەسەندن، کەوابوو دەبێ پەیڕەویی لەتۆش بکەن، چونکە تەوراتە دەسکاری نەکراوەکەیان فەرمانیان پێدەکا کە: باوەڕ بەوپێغەمبەرە بێنن لە ئاخر زەماندا دێت، ئەمانەیان راست وئیماندارن ، نەك ئەوانەیان کە تەوراتیان گۆڕیی و کاریان پێنەکردو لە تۆش یاخی بوون ﴿ومن یکفر به﴾ هەرکەسیش کافرو بێباوەڕ بێ پێی ﴿فأولئك هم الخاسرون﴾ ئەوانە زیانمەند دەبن و، دەچنە ڕیزی زیان لێکەوتوانەوە ﴿[١٢٢] یابنی إسرائیل اذکروا نعمتي التی أنعمت علیکم﴾ ئەی کوڕان ونەوەی یەعقووب! یادی ئەوگشت نیعمەت و بەخششانەم بکەنەوە ڕشتم بەسەرتاندا ﴿وانی فضلتکم علی العالمین﴾ و لە بیریشتان بێت کە: فەزڵ و ڕێزمدان بەسەر تەواوی خەڵکی جیهانی خۆتاندا ﴿[١٢٣] واتقوا یوما لاتجزی نفس عن نفس شیئا﴾ وە لەو ڕۆژە خۆ بپارێزن کە: ڕۆژی نەفسی نەفسییەو هەرکەس بۆخۆیەتی ﴿ولا یقبل منها عدل﴾ وهیچ بارمتە وبریتیەکیش لەباتی هیچ کەسێك وەرناگیردرێ ﴿ولا تنفعها شفاعة﴾ وە هیچ تکاو پاڕانەوەیەکیش بەهانای کەس نایەو سوودی نابێت ئەگەر بەبێ باوەڕ مردبێ ﴿ولا هم ینصرون﴾ وە لە هیچ لایەکیشەوە یارمەتیی نادرێن و کۆمەك ناکرێن.

**ئیبراهیم و ئیمامەت:**

جا دوای باسکردنی مێژوویەکی دێرینی هۆزی جوولەکەو لاسارییان، واتە: ئەوانەی کەنامەیان بۆ هات و نافەرمانی خوایانکرد! دێتە سەرباسی نموونەیەکی پرشنگداری گوێڕایەڵانی فەرمانی خوا، وەك ئەفەرموێ: ﴿[١٢٤] وإذ ابتلی إبراهیم ربه بکلمات فأتمهن﴾ ئەوکاتە وەبیربێنەوە خوای پەروەردگار ئیبراهیمی بەچەند وشەو کاروکردەو فەرمان (لاإله إلاالله ، قوربانیی کردن بەئیسماعیلی کوڕی) تاقیکردەوە، ئینجا ئەویش زۆر بە چاکیی وجوامێرانە گشت فەرمانەکانی جێبەجێکرد وئەنجامیدان، وەك لەجێگایەکی تردا دەفەرموێ: (وإبراهیم الذی وفی) (٣٧/٥٣). ﴿قال إني جاعلك للناس إماما﴾ ئەوسا کەئیبراهیم لە هەموو تاقیکردنەوەکاندا دەرچوو، خوای گەورە پێی فەرموو: بەڕاستیی لەپاداشی گوێڕایەڵی وجێبەجێ کردنی فەرمانەکانمدا، بڕیارمدا بتکەمە پێشەواو ڕابەری خەڵکی دنیا ﴿قال ومن ذریتی﴾ ئیبراهیمیش گوتی: حەز دەکەم وەچەو زاڕۆڵەکانیشم بەهرەمەندبن وببنە ڕابەری خەڵکیی ﴿قال لا ینال عهدی الظالمین﴾ خوا فەرمووی: پەیام وپەیمانی من (پەیامبەرێتی وپێشەوایەتی) هەرگیز بە خەڵکانی بێ باوەڕ وسنوور بەزێن نادرێ. ئینجا زاناکانیشمان دەڵێن: (الظالم: لایصلح أن یکون خلیفة ولا حاکما ولا مفتیا ولا شاهدا ولا راویا) واتە: مرۆڤی ستەمکار وناهەقیکار، بۆخەلیفەیی و، بۆداوەریی و، بۆموفتیی، بۆشایەدو، بۆگێڕانەوەی هەواڵ وفەرموودە دەسنادات، بە کورتیی: پیاوی کافرو ستەمکار -لەتەرازووی ئیسلامدا- بەکەڵکی هیچ ئیش و کارێکی ئاینیی و کۆمەڵایەتی موسڵمانان نایەت.

رێنماییەکانی ئایەتی (١٢٤):

١- بە پێشەوا بوون و وەرگرتنی (ئیمامەت) بە هۆی باوەڕی ساف ویەقین و خۆڕاگری لەسەر ئەهلی هیدایەت نەبێ، وەدەس نایە، ئایەتی: (وجعلنا منهم أئمة یهدون بأمرنا لما صبروا وکانوا بآیاتنا یوقنون) (٢٤/٢٤) گەورەترین بەڵگەیە بۆ ئەو هەقیقەتە.

٢- (ولایة العهد) واتە: دیاریکردنی جێنیشین و خەلیفە لەلایەن پێشەواوە بۆ خۆی، هەرلە ژیانی خۆیدا لەدینی ئیسلامدا ڕێگە دراوەو ڕەوایە، بەمەرجێك ئەو (وەلی عەهد)ە خاوەن باوەڕو زانیارو کۆشەرو دادگەرو خۆڕاگربێ و،

وەکو(عومەری کوڕی عبد العزیز– ڕەحمەتی خوای لێبێت – دەڵێ: ئەنجوومەنی ئەو سەردەمە ڕەزامەندی لەسەر بدەن و پەسەندیان بێت .

٣– هەستان بەداوا شەرعیەکان، شیاویی بەمرۆڤ دەدات بۆپێشەوایەتیی. سەبارت بەخەلافەت هەر لە چەرخی هاوەڵانەوە سێ بۆچوون هەبووە: یەکەم: لە ئال و بەیت بێت. دووەم: لەقورەیش. سێیەم: لە ناو توێژەکانی جەماوەردا کێ شیاوە؟ لە راو بۆچوونەکانی(عومەر)یشەوە رای سێیەم لە پەسەند دەچێت، بەڵام بۆ ئەوە رێز لەهەرسێ بۆ چوونەکە بگیردرێ، هەڵبژاردنێکی پاك و شەرعیی لەناو هەرسێ تاقمەکەدا بکرێت باشە.

تێبینی:ناوی ئیبراهیم ﷺ: لە(٢٥) سوورەتی قورئاندا(٦٩)جار هاتووە.

**مەزنیی و گەورەیی کابە :**

﴿[١٢٥] وإذ جعلنا البيت مثابة للناس وامنا﴾ ئەمەشت وەبیربێ کە: کەعبەمان کردە پەناگاو مەڵبەندی ئەمن وئاسایش و هێمنیی و کۆبوونەوە بۆگشت خەڵکانی دنیا، بەشێوەیەك ئەر لەماڵی کابەدا بکوژ ببینرایە، کەس وکاری کوژراوەکە بۆیان نەبوو دەستی بۆ بەرن!. (بوخاریی) دەڵێ: (عومەری کوڕی خەتاب)– خوا لێی ڕازی بێ– بەپەیامبەری گوت: خۆزگە جێ وەستانەکەی ئیبراهیمت دەکردە نوێژگە، ئینجا خوا ئەم ئایەتەی ناردو فەرمووی: ﴿واتخذوا من مقام إبراهيم مصلى﴾ جێ ومەقامەکەی ئیبراهیم بکەنە نوێژگەی خۆتان، واتە: لەلای ئەوبەردەدا لەکاتی دروستکردنی کەعبەدا، ئیبراهیم دەیخستە ژێرپێی، نوێژو تاعەت بکەن ﴿وعهدنا إلى إبراهيم وإسماعيل﴾ ئینجا (ئیبراهیم وئیسماعیل)مان راسپاردن ﴿أن طهرا بيتي للطائفين والعاكفين والركع السجود﴾ کەماڵەکەم – کەعبە– بۆئەوانەی تەوافی ئەکەن وبەدەوریا دێن ودەچن، و بۆئەوانەش ئیعتیکافی تێدادەکەن ولەوێ دەمێننەوە، و بۆ رکوعبەران وسوژدە بەران لەبت و بتپەرستیی پاك بکەنەوە.

تێبینی: وشەی (ئیسماعیل) لە قورئاندا (١٢) جار هاتووە.

**ماڵی خوا پاك رابگرن:**

﴿[١٢٦] وإذ قال إبراهيم رب اجعل هذا بلدا آمنا﴾ ئەو دەمەش وەبیر بێنە کە ئیبراهیم دۆعای کردو وتی: پەروەردگارەکەم ئەم جێگایە واتە: –کەعبە– بەشارێکی بێوەیی وهێمن وئاسایش رابگرە ﴿وارزق أهله من الثمرات من آمن منهم بالله واليوم الآخر﴾ رزق و رۆزیی و میوەو (خواردەمەنی)یان پێ ببەخشە، بەتایبەتی ئەوانەیان باوەڕیان بەخواو بە ڕۆژی دوایی هەیە ﴿قال ومن كفر فأمتعه قليلا﴾ خواش فەرمووی: دۆعاکەت گیرا دەکەم و، مرۆڤە بێ باوەڕەکانیش، سەردەمێکی کەم، دەژێنم وخۆشی وەردەگرن و، لەنازونیعمەتی ئەم دنیایە رادەبوێرن. (قورتوبیی) دەڵێ: وەرگرتنی رزق ورۆزی وبژێوی لەسەران و دەسەلاتدارانی سەردەم، سێ حاڵەتی هەیە: یەکەم: ئەر دارایی و دەسکەوتەکانی دەوڵەت لەسەر بنەمای شەریعەتی ئیسلام بێت، دیارە حەڵاڵ و ڕەوایە، چونکە هاوەڵان و پاشینانی ئەوان، لە دەستی(حەجاج) بژێویان وەر دەگرت. دووەم: ئەگەر لە حەڵاڵ و حەرام تێکەڵ بوو–وەکو ئەمڕۆ–ئەو ئەر بگونجێ وەر نەگیردرێ، ئەگینا بۆ خەڵکانی ئاتاج ومۆتاج قەیدی نیە. سێیەم: خۆ ئەر دارایی دەوڵەت، بە ئاشکرا حەرام وناڕەوابوو، بێ سۆ لەحاڵەتی ئاوادا وەرگرتنی نارەواو نادروستە. ﴿ثم اضطره إلى عذاب النار وبئس المصير﴾ پاشان بەرەو سزای بەتینی ئاگر دەیپێچمەوە، ئای چ خراپ وشوومە جێگاو چارەی وا!. ئیبراهیم ﷺ نازونیعمەتەکانی دنیاشی هەروەکو پێشەوایەتی و ئیمامەت تەماشا کرد، بۆیە تەنها بۆ باوەڕدارەکانی داوا کرد. (ئالووسیی) دەڵێت: لەوسەردەمەدا میوەی بەهارەو هاوینەو پاییزە لەوشارەدا کۆدەبوویەوە.

## دروستکردنی کابە:

﴿١٢٧ وإذ يرفع إبراهيم القواعد من البيت وإسماعيل﴾ ئەودەمە بخەوە یادی گەلەکەت کە: (ئیبراهیم وئیسماعیل) پایەو بناغەی کەعبەیان دادەڕشت و بەرزیان دەکردەوەو، بەدەم ئەوەشەوە زیکریان دەکردو دەیانگوت: ﴿ربنا تقبل منا إنك انت السميع العليم﴾ پەروەردگاری ئێمە! ئەم خزمەت و کارەیەمان لێوەرگرە، بەڕاستیی هەرئەتۆی زۆر ژنەوا بۆپاڕانەوەو لاڵەمان، هەرخۆیشت فرە زاناو، ئاگاداری گشت نیازو مەبەستەکانمانی. بەڵێ مرۆڤی باوەڕدار دەبێ هەمیشە لە ئەنجامدانی ئاکاری چاکە خێردابێ و، هەردەم لەخواش داوا بکا بۆ وەرگرتنی، وەکو ئایەتی: (والذين يؤتون ما آتوا وقلوبهم وجلة..) (٢٣/٦٠) ڕاستیی ئەم مەبەستەیە دووپات دەکاتەوە ﴿١٢٨ ربنا واجعلنا مسلمين لك﴾ ئەی پەروەردگارمان! وابکە کە هەردووکمان لە تەواوی ئێش وکارەکاندا هەر ملکەچ و بەرفەرمانی تۆ بین، تا بتوانین هیچ شتێك نەکەینە شەریك و هاوبەشت ﴿ومن ذريتنا امة مسلمة لك﴾ وە لەناو منداڵ و نەوەکانیشماندا ئوممەت و گەل و کۆمەڵێك رابێنە کە: ئەوانیش ملکەچ ودڵسۆزبن و، تەنها ڕوو لەتۆ بکەن ﴿وارنا مناسكنا﴾ وە ڕێوو ڕەسمی حەجی ئەو شوێنە پیرۆزەشمان نیشان بدە، تابزانین چۆن بەرێك وتەواوی بتپەرستین و حەجت بۆ بکەین ﴿وتب علينا إنك انت التواب الرحيم﴾ و یارمەتیمان بدە بۆ گەڕانەوە بۆلای خۆت و، تەوبەمان لێوەرگرە، چونکە بەڕاستیی تەنها هەر ئەتۆی تەوبە وەرگرو دڵاوا لەگەڵ بەندەکانتدا.

وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَٰهِـۧمُ ٱلْقَوَاعِدَ مِنَ ٱلْبَيْتِ وَإِسْمَـٰعِيلُ رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿١٢٧﴾ رَبَّنَا وَٱجْعَلْنَا مُسْلِمَيْنِ لَكَ وَمِن ذُرِّيَّتِنَآ أُمَّةً مُّسْلِمَةً لَّكَ وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا وَتُبْ عَلَيْنَآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٢٨﴾ رَبَّنَا وَٱبْعَثْ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١٢٩﴾ وَمَن يَرْغَبُ عَن مِّلَّةِ إِبْرَٰهِـۧمَ إِلَّا مَن سَفِهَ نَفْسَهُۥ وَلَقَدِ ٱصْطَفَيْنَـٰهُ فِى ٱلدُّنْيَا وَإِنَّهُۥ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿١٣٠﴾ إِذْ قَالَ لَهُۥ رَبُّهُۥٓ أَسْلِمْ قَالَ أَسْلَمْتُ لِرَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٣١﴾ وَوَصَّىٰ بِهَآ إِبْرَٰهِـۧمُ بَنِيهِ وَيَعْقُوبُ يَـٰبَنِىَّ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰ لَكُمُ ٱلدِّينَ فَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٣٢﴾ أَمْ كُنتُمْ شُهَدَآءَ إِذْ حَضَرَ يَعْقُوبَ ٱلْمَوْتُ إِذْ قَالَ لِبَنِيهِ مَا تَعْبُدُونَ مِنۢ بَعْدِى قَالُوا۟ نَعْبُدُ إِلَـٰهَكَ وَإِلَـٰهَ ءَابَآئِكَ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَـٰعِيلَ وَإِسْحَـٰقَ إِلَـٰهًا وَٰحِدًا وَنَحْنُ لَهُۥ مُسْلِمُونَ ﴿١٣٣﴾ تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ وَلَا تُسْـَٔلُونَ عَمَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٣٤﴾

## ئیبراهیم داوای ناردنی پەیامبەر دەکا:

﴿١٢٩ ربنا وابعث فيهم رسولا منهم﴾ پەروەردگارمان! هەر لەزاروڵەو نەوەکانیاندا (نەوەکانی ئیبراهیم خۆی) پەیامبەرێك بۆ ئەوخەڵکی (حەرەم)ە بەرێ بکە ﴿يتلوا عليهم آياتك﴾ تا ئایەکانی تۆیان بەسەرا بخوێنێ ﴿ويعلمهم الكتاب والحكمة﴾ وفێری بەرنامەکەی تۆیان بکات" (قورئان و سوننەت) یان ئاشناوشارەزا بکە ﴿ويزكيهم﴾ و نەفسیان لەهەموو کارێکی خراپ و ناپەسەند پاك ڕاگرێ و، هەرخەریکی تۆناسین بن ﴿إنك انت العزيز الحكيم﴾ بە ڕاستیی تەنها هەر ئەتۆ خوایەکی زاڵ و دەسەڵاتدارو کارجوان و جوانکارییت. بەڵێ.. دۆعاو نزاکەی ئیبراهیم گیرابوو و خوای میهرەبان پێغەمبەرێکی شەریف و دڵسۆزو ڕەوشت بەرز وەکو (پێغەمبەرمان موحەممەد)ی بۆ ناردن.

## مەگەر گەوج لە دینی ئیبراهیم لابدا:

دوای ئەوە کەباسی ڕاستیی و شیاوی دین و ئایینەکەی ئیبراهیمی کرد، ئەوسا دێتە سەر لۆمە کردن و سەرکۆنەی ئەوانەی پشتی لێدەکەن، وەك دەفەرموێ: ﴿١٣٠ ومن يرغب عن ملة إبراهيم إلا من سفه نفسه﴾ کێ هەیە بەدەر لەوکەسە خۆی گێل وگەوج بکا، ئایینی ئیبراهیم بنێتە لاوەو لابدا لێیی و، دەست بداتە بت پەرستیی؟ ﴿ولقد

اصطفيناه فى الدنيا﴾ سوێندبێ بەخوا، ئێمە لەم دنیایەدا ئیبراهیممان هەڵبژاردوو، پایەی پەیامبەرێتی و پێشەوایەتیمان پێبەخشی ﴿وإنه فى الآخرة لمن الصالحين﴾ و لەدوا ڕۆژیشدا وا لەڕیزی چاکان و صاڵحاندا ﴿[١٣١] إذ قال له ربه أسلم﴾ ئەو دەمە کەپەروەردگاری هەڵیبژاردو پێی فەرموو: دەبێ ملکەچی بڕیارو فەرمانی من بی و، خۆ تەسلیمی ئێمە بکەیت، ئەوجا ئەویش ﴿قال أسلمت لرب العالمين﴾ گوتی: وا خۆم تەسلیم و ملکەچی فەرمانەکانی پەروەردگاری جیهان کردو، تەنیا ڕووڵەو دەکەم.

**ئیبراهیم و یاقووب کوڕەکانیان رادەسپێرن بەم ئیسلامە:**

﴿[١٣٢] ووصى بها إبراهيم بنيه ويعقوب﴾ ئیبراهیم و یەعقووب، ئەو ئایینەیان بەکوڕەکانیان وەسیەت کردو ڕاسپارد: ﴿يابنى إن الله اصطفى لكم الدين﴾ گوتیان: ڕۆڵەکانم..! بێگومان بن کەخوا ئەم ئایینی یەکتاپەرستییەی هەڵبژاردووە بۆتان ﴿فلا تموتن إلا وانتم مسلمون﴾ دەسا ئێوەش هەوڵ بدەن کە تەنیاو تەنیا بەموسڵمانێتی بمرن، واتە: تەنها ساتێك لەم دینە کلا نەبن ودوور نەکەونەوە لێی.

**ڕێنماییەکانی ئایەتی (١٣٠-١٣٢):**

١- نەزان و گێلە پیاو نەبێ، کێ ڕوو لەئیسلام وەردەگێڕێ ؟.

٢- ئایینی ئیسلام، ئاینی هەموو پێغەمبەرانە، ئەگەرچی شێوەو شێوازی کاریشیان جیا بووبێ، دیارە بێجگە لەویش، هەموو دین و بیروو بیرۆکەیەك، داهێنراوو باتڵە.

٣- سوننەتە هەموو کەسێك "بەتایبەتی نەخۆش" پەیمان لەمنداڵ و کەس وکاری خۆی وەرگرێ کە: تامردن دەس لەئیسلام بەر نەدەن و، لادین نەبن.

**تێبینی:** یەعقووب (١٦) جار ناوی لە قورئاندا هاتووە.

جوولەکە ئەیانوت: یەعقووب فەرمانی بەکوڕەکانی کردووە کە دەبێ هەر لەسەر ئایینی جوولەکە بن، بۆیە خوا ئەوقسەیە دەداتەدواوەو دەفەرموێ: ﴿[١٣٣] ام كنتم شهداء إذ حضر يعقوب الموت﴾ ئاخۆ لەسەرەمەرگی یەعقووبدا، ئێوە ئامادە بوون تابزانن لەوکاتەدا چی گوت بەکوڕەکانی؟ ﴿إذ قال لبنيه ما تعبدون من بعدى﴾ بە تایبەتی ئەوکاتە کەپێی گوتن: کوڕەکانم! دوای مردنی من چی دەپەرستن؟ ﴿قالوا نعبد إلهك وإله آبائك إبراهيم وإسماعيل وإسحاق إلها واحدا﴾ هەموو گوتیان: ئێمەش هەرخواکەی تۆو، خواکەی باووباپیرانی تۆ(ئیبراهیم وئیسماعیل و ئیسحاق)، بەتاك و تەنیایی دەپیەرستین و، هیچ شتێ ناکەینە شەریك وهاوبەشی ﴿ونحن له مسلمون﴾ وهەمووشمان تەنها بۆئەو تەسلیم وملکەچ دەبین، لەجێگایەکی تردا دەفەرموێ: (وله أسلم من فى السموات والأرض طوعا وكرها وإليه يرجعون)، یان دەفەرموێ: (وماأرسلنا من قبلك من رسول إلا نوحى إليه أنه لاإله الا أنا فاعبدون) پێغەمبەریش دەفەرموێ: ((نحنُ معشرَ الأنبياءِ أولادُ عَلّاتٍ، دينُنا واحِدٌ)) واتە: ئێمەی پێغەمبەران، گشت وەکو کوڕی بابێکین، تەنیا دایکمان جیایە، مەبەست ئەوەیە کە هەموو لەبنەڕەتدا ئیش وکارمان یەکە، مەگەر لەهێندێ لق وپۆپدا فەرق وسوونێك هەبێ ﴿[١٣٤] تلك امة قد خلت﴾ بەڵێ ئەمانە -ئیبراهیم وکوڕەکانی ئەو- ئوممەت وگەلێك بوون کە تێپەڕیان کردوو ڕۆیشتن ﴿لها ما كسبت ولكم ماكسبتم﴾ هەرشتێکیان کردبێ چاك، یان خراپ هەر بۆخۆیانە، ئەوەش ئێوە کردووتانە هەر بۆخۆتان ئەبێ ﴿ولا تسألون عما كانوا يعملون﴾ و لەدواڕۆژیشدا پرسیاری کارو کردوەوەی ئەوانتان لێناکرێت. یاسای خوا وایە کەهیچ کەسێك بەکردارو ڕەفتاری کەسێکیتر گرفتار نەبێ و، هەرشتێکیشی کرد، هەر بۆخۆی بێ، پێشەوا غەزالی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: هەر کە باوکێکی برسی بەنانخواردنی کوڕەکەی تێربوو،

وە یان بە ئاوخواردنی ئەو تێراوبوو، ئەودەمەش کوڕی تاوانبار بەهۆی باوکیەوە ڕزگار دەبێ. ﴿[١٣٥] وقالوا كونوا هودا أونصارى تهتدوا﴾ خاوەن نامەکان بە موسڵمانەکانیان دەگوت: وەرن ببنە جوولەکە، یا فەلە، ئەوسا دەکەونە سەر ڕێی ڕاست! جابۆ ڕاستکردنەوەی ئەو بۆچوونە هەڵەیان، خوا فەرمووی: ﴿قل بل ملة إبراهيم حنيفا وماكان من المشركين﴾ ئەی موحەممەد! ﷺ پێیان بڵێ: نەخێر، یەهوودییەت ونەصرانییەتی وامان ناوێ، بەڵکو ئێمە هەرلە ئایینی پاك و بێخەوشی (ئیبراهیم) پەیڕەویی دەکەین، چونکە ئەو لەهەموو بەرنامەیەکی لارو خێچ لایداوەو، هەرگیزیش لەهاوبەشدانەران نەبوو.

## موسڵمان باوەڕی بە گشت کتێب و پێغەمبەرێك هەیە:

﴿[١٣٦] قولوا آمنا بالله وما انزل إلينا﴾ ئەی بڕواداران! بڵێن: ئێمە باوەڕمان بەخواو بەو(قورئان)ـە بۆمان دابەزیوە هەیە ﴿وما انزل إلى إبرهيم وإسماعيل و إسحاق ويعقوب والأسباط﴾ وە بەو بەرنامەیە کە بۆ (ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و نەوەکانیان) نێردراوە ﴿وما أوتى موسى وعيسى﴾ و بەوکتێبەش بە مووساو بەعیسا دراوە ﴿وما أوتى النبيون من ربهم﴾ و بەوپەیامەش بەهەموو پەیامبەرانی تر دراوە لەلایەن پەروەرگاریانەوە ﴿لانفرق بين احد منهم﴾ هیچ فەرق وجیاوازییەکیش، ناخەینە نێوان هیچ کامێکیانەوە، واتە: باوەڕمان بە هەموان هەیەو، ئێمە وەکو ئەوانە ناکەین قورئان لە بارەیانەوە دەفەرموێ: (ويريدون ان يفرقوا بين الله ورسله ويقولون نؤمن ببعض ونكفر ببعض ويريدون ان يتخذوا بين ذلك سبيلا) ﴿ونحن له مسلمون﴾ وەبە تەنیاش ملکەچی فەرمانەکانی ئەوین، واتە: هەرفەرمانێ بەسەرماندا بدا، ئامادەین و سوپاسیشی دەکەین ﴿[١٣٧] فإن آمنوا بمثل ما آمنتم به فقد اهتدوا﴾ جا ئەر ئەوخاوەن نامانەو، خەڵکانی تر، وەکو ئێوە باوەڕیان هێنا، مانای وایە کە بەڕاست و ڕەوان کەوتونەتە سەر ڕێی ڕاست و ڕێنمابوون ﴿وإن تولوا فإنما هم فى شقاق﴾ خۆئەر لەهەق پشتیان هەڵکردو باوەڕیان نەهێنا، دیارە کە لەهەق وراستیی لایانداوەو لە دژایەتیدان ﴿فسيكفيكهم الله وهو السميع العليم﴾ ئەوسا تۆش ئەی موحەممەد ﷺ! هەر خوات بەسە و، لەئازارو بێزاریان دەتپارێزێ وزاڵت دەکات بەسەریاندا، وزۆریش بیسەرو فرەزانە، واتە: بەهەموو سرپەو چرپەیەکیان ئاگادارە ﴿[١٣٨] صبغة الله﴾ ئەم ئایین وبەرنامەی خوایە، کە ئێستا تۆی لەسەرە، ڕەنگ ونەخشەیەکە، خوای لەکارزان بەدەستووری خۆی دایڕشتووە ﴿ومن أحسن من الله صبغة﴾ دەبێ کێ لەخوا جوانتر ڕەنگ ونەخشە بڕێژێ ؟ ﴿ونحن له عابدون﴾ وئێمەش گشتمان تەنها ئەو دەپەرستین وتەسلیمی ئەودەبین ﴿[١٣٩] قل أتحاجوننا فى الله﴾ ئەی موحەممەد ﷺ! پێیان بڵێ: ئایا بۆ ئێوە ڕەوایە لەبارەی دین و ئایینی خواوە، ململانێ و دەمەقاڵێ لەگەڵ من بکەن، لەگەڵ ئەوەیشدا

الجزء الأول    سورة البقرة

وَقَالُواْ كُونُواْ هُودًا أَوْ نَصَٰرَىٰ تَهْتَدُواْۗ قُلْ بَلْ مِلَّةَ إِبْرَٰهِـۧمَ
حَنِيفًاۖ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ١٣٥ قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ
أُنزِلَ إِلَيْنَا وَمَآ أُنزِلَ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ
وَٱلْأَسْبَاطِ وَمَآ أُوتِىَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَمَآ أُوتِىَ ٱلنَّبِيُّونَ
مِن رَّبِّهِمْ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُۥ مُسْلِمُونَ ١٣٦
فَإِنْ ءَامَنُواْ بِمِثْلِ مَآ ءَامَنتُم بِهِۦ فَقَدِ ٱهْتَدَواْۖ وَّإِن تَوَلَّوْاْ فَإِنَّمَا
هُمْ فِى شِقَاقٍۖ فَسَيَكْفِيكَهُمُ ٱللَّهُۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ
١٣٧ صِبْغَةَ ٱللَّهِۖ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ صِبْغَةًۖ وَنَحْنُ لَهُۥ
عَٰبِدُونَ ١٣٨ قُلْ أَتُحَآجُّونَنَا فِى ٱللَّهِ وَهُوَ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ
وَلَنَآ أَعْمَٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ وَنَحْنُ لَهُۥ مُخْلِصُونَ ١٣٩ أَمْ
تَقُولُونَ إِنَّ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ
وَٱلْأَسْبَاطَ كَانُواْ هُودًا أَوْ نَصَٰرَىٰۗ قُلْ ءَأَنتُمْ أَعْلَمُ أَمِ ٱللَّهُۗ
وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَتَمَ شَهَٰدَةً عِندَهُۥ مِنَ ٱللَّهِۗ وَمَا ٱللَّهُ
بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ١٤٠ تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْۖ لَهَا مَا كَسَبَتْ
وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْۖ وَلَا تُسْـَٔلُونَ عَمَّا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ١٤١

٢١

خۆتان بە کوڕو خۆشەویستی ئەو دەزانن ؟! ﴿وهو ربنا وربكم﴾ و پەروەردگاری ئێمەو، پەروەردگاری ئێوەیشە، هەموو کارێ شایستەی خۆیەتی ﴿ولنا أعمالنا ولكم أعمالكم﴾ وکاروکردەی خۆمان بۆخۆمان و، کاروکردەی خۆشتان بۆخۆتان، واتە: ئێمە لە کارەکانی ئێوە بێزارو بەرین ، دیارە ئێوەش کارتان بەئێمە نیە، لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: (وإن كذبوك فقل لى عملى ولكم عملكم أنتم بريؤن مما أعمل وأنا برئ مما تعملون) ﴿ونحن له مخلصون﴾ وە ئێمە بەدڵی پاك و بە دڵسۆزانە ئەو پەروەردگارە دەپەرستین و، ملکەچی دەبین، واتە: کاکڵەو حەقیقەتی ئاییندارییی، دڵسۆزی وخۆیەکلاکردنەوەیە بۆخوا ﴿[١٤٠] أم تقولون إن إبراهيم واسماعيل وإسحاق ويعقوب والأسباط كانوا هودا أو نصارى﴾ یان بەلاتانەوە وایەو دەڵێن : (ئیبراهیم وئیسماعیل ویەعقووب وکوڕو نەوەکانی ئەو) جوولەکە یان فەلە بوون ؟! ﴿قل أأنتم أعلم أم الله﴾ پێیان بڵێ- ئەی موحەممەد ﷺ! باشە خوا چاکتر دەزانێ یان ئێوە؟ دیارە کەخوا لەهەموان چاکتر بەئاگایەو دەزانێ، دە خۆ ئەورایگەیاند کە: ئەوانە هیچیان نەجوولەکە بوونە، نەفەلە، وەکو دەفەرموێ: (ماكان إبراهيم يهوديا ولا نصرانيا ولكن كان حنيفا مسلما وما كان من المشركين) ﴿ومن أظلم ممن كتم شهادة عنده من الله﴾ دەبێ کێ لەو کەسە ستەمکارتر بێ، شایەتیەکی لابێ و لەخوای بشارێتەوە؟ خاوەننامەکان لەکتێبەکانیاندا هاتبوو کە: دینی پەسەندو قبوولْ لای خوا، هەردینی ئیسلامە، موحەممەدیش پێغەمبەری خودایە، ئەو بەرێزانەش هیچ کامێکیان، نەجوولەکەو،نەگاور بوون ﴿وما الله بغافل عما تعملون﴾ دەسا بزانن، هەرچۆنێ ئێوەهەق و راستیەکان بشارنەوە، هەرگیز خوا لەوکاروکردەیەتان دەیکەن، خافڵ وبێ ئاگانیەو، حسێبی وردتان لەگەڵدەکات ﴿[١٤١] تلك أمة قد خلت لها ما كسبت﴾ ئەم پەیامبەرو نەتەوانەیان، ئوممەت وکۆمەڵێکبوون ومردن ، وەبەخۆیان و کاروکردەیانەوە چوون وتێپەرین و، هەرشتێکیشیان کردبێ پاداشەکەی بۆخۆیانە ﴿ولكم ماكسبتم﴾ ئێوەش هەرشتێکتان کردبێ هەر بۆخۆتانە ﴿ولا تسألون عما كانوا يعملون﴾ وەلەهیچ کاروکردەیەکی ئەوانیش بەرپرس نابن، واتە: هەرچەند خۆتان بەنەوەی ئەوانە بزانن، هەتا پەیرەوییان لێ نەکەن و، بەچاکی بەدوایاندا نەچن، کەڵك وسوودیان لێنابینن بەتایبەتی ئەگەرباوەڕتان بەموحەممەد- نەبێت خوا نەناس وجەحەندەمین.

کۆتایی جزمی یەکەم

ولله الحمد والمنة

*** *** ***

## گۆڕینی رووگەو حیکمەتەکەی:

پەیامبەر ﷺ تا لەمەککەدا بوو، -وەکو پەیامبەرانی (بەنی ئیسرائیل)- لە نوێژەکاندا روویدەکردە (بەیتولمەقدیس) ئەگەرچی لەدڵیشەوە حەزی دەکرد خوا مۆڵەتی بدا رووبکاتە کەعبەی پیرۆز، بۆیە تا ئەورۆژە رووگە گۆڕا، بە جۆرێ نوێژەکانی دەکرد، سوچێکی (صەخرە) و (کابە)یشی دەگرتەوە، جا کەهاتە (مەدینە)ش شانزە مانگ هەر بەوحاڵەتەوە مایەوەو، بۆی نەگونجاو مۆڵەت نەدرا روو بکاتە کەعبە، بۆیە هەموو جارێ لەخوا دەپاڕایەوە، تابەڵکو وەکو (ئیبراهیم) علیه السلام مۆڵەتی بداو روو بکاتە کەعبە، ئەوسا بۆ وەڵامی ئەم مەبەستە -وەك (سیووتیی) و(ئیبن کەسیر) دەڵێن- ئایەتی: (قد نرى تقلب وجهك ..)ـە هاتە خوارەوە. ئینجا باسی هەندێ کەس دەکا کە چۆن بێ بیرکردنەوە، لە حیکمەت وئەنجامی ئەم ئاڵوگۆڕەیە، تانەو تەشەرو تەنز لە زاریانەوە دەردەچێ و، رەخنە دەگرن، بۆیە دەفەرموێ: ﴿[١٤٢] سيقول السفهاء من الناس﴾ بێگومان خەڵکە دەم بە تاڵ و گێل ونەزانەکان-

لەجوولەکەو کافرەکانی مەککەو مونافقەکانی مەدینە- رەخنە دەگرن و دەڵێن: ﴿ما ولاهم عن قبلتهم التی کانوا علیها﴾ باشە! دەبێ چ شتێ وای لێکردبن کە واز لەو ڕووگەیە بێنن، جاران لەسەری بوون و گشت جارێ ڕوویان تێدەکرد، واتە: (بیت المقدس) کە ڕووگەی پێغەمبەرانی پێشووە ؟ ﴿قل لله المشرق و المغرب﴾ لە وەڵامیاندا بڵێ: ئەی موحەممەدﷺ! سەرجەمی خۆرهەڵات و خۆرئاوا، بگرە هەموولایەکی جیهان، هەرهی خوایە و ئەوخاوەنیەتیی و، ئارەزووی خۆشیەتی کوێ دەکاتە قیبلە، جارێ (بیت المقدس) ، جارێکیش کەعبە، چونکە دەسەڵاتداری بێ سنوورە ﴿یهدی من یشاء إلی صراط مستقیم﴾ مەیلی لە هەرکەسێك هەبێ، ڕێنمایی دەکات بۆ ڕێی ڕاست و، گرنگیش گوێڕایەڵی و دامەزراندنی دڵەکانە لەسەر ئەوەی کەخوا بۆیانی دیاری دەکات، کەوابوو دەبێ تەسلیمی فەرمان وبڕیارەکانی بین ﴿١٤٣ وکذلك جعلناکم امة وسطا﴾ هەرچۆنێ بۆ ئایینی پیرۆزی ئیسلام، ڕێنماییمانکردن ، هەرئاواش لە تەواوی ئیش وکاردا، کردومانن بە ئوممەت و گەلێکی میانەڕەو، واتە: ئێوە ئەی موسڵمانان! نە وەکو (نەصارا) زێدە ڕەون، نەوەکو جوولەکەش کەمتەرخەمن، کەوابوو ئێوە ئوممەتێکی خێرخواز وهەڵبژێردراون ﴿لتکونوا شهداء علی الناس﴾ تالەسەر ئەوخەڵکە ببنە شایەت کە: بەڵێ.. پەیامبەر ﷺ پەیامەکەی خوای گەورەی بەڕاست ورەوان گەیاند ﴿ویکون الرسول علیکم شهیدا﴾ و پەیامبەریش بەسەر گشتتانەوە چاودێرو شایەت بێت: ئاخۆ کێ دوایکەوتوو، کێش سەرپێچی لێکرد، وەلەڕۆژی قیامەتیشدا لەولاشەوە هەم پێغەمبەرو ﷺ هەم ئوممەتەکەی ببنە شایەت بۆ پێغەمبەران کە بەرنامەکەی خوایان گەیاند بەئوممەتەکەیان ﴿وما جعلنا القبلة التی کنت علیها﴾ ئەو قیبلەو ڕووگەیەش کە تۆ لە بەرا لەسەری بوویت، واتە: (بەیتولمەقدیس) هەربۆیە گۆڕیمان ﴿إلا لنعلم من یتبع الرسول ممن ینقلب علی عقبیه﴾ تا بزانین و دەرکەوێ کێ لەپێغەمبەر ﷺ پەیڕەوی دەکاو، کێش هەڵدەگەڕێتەوە سەر ڕابووردووی خۆی، واتە: لەم ئاڵ و گۆڕەدا دەر دەکەوێ کێ گوێ ڕایەڵەو، کێش لارو لاسارە، بەڵێ ئیسلام هەر وەکو هەوڵ دەدا لە هەموو هۆکارێکی زەوبی دڵەکان نەجات بدات، هەر ئاواش دەیەوێ لەهەموو رەگەزو عونصورێك ڕزگاری بکات، بۆیە جارێ ڕوویدەکاتە (بیت المقدس)، جارێکیش کابە ﴿وان کانت لکبیرة إلا علی الذین هدی الله﴾ خۆ بێگومانە کە گۆڕینی ئەو ڕووگەیە، بەم ڕووگە تازەیە لەسەر شانی هەندێك، زۆر دژوارو کارێکی گەورەو سەخت بوو، مەگەر بۆ کەسانێ وا کە خوا خۆی ڕێنمایی کردبن و گوێڕایەڵبن و خۆ تەسلیمی بکەن ﴿وما کان الله لیضیع إیمانکم﴾ و خۆ خواش پاداشتی، ئەو نوێژو بڕوای جارانتانە بە فیڕۆنادا، واتە: لەوەوپێش ڕووتان لەهەر جێگایەك کردبێ، ئێستا خوا بێ پاداشتتان ناکا، چونکە تازە ئەوە ڕۆیشتووە و تێپەڕیوە، بەڵام ئەگەر لەمەودوا ڕوونەکەنە ئەو ڕووگە تازەیە بەر پرسیار دەبن ﴿إن الله بالناس



۞ سَيَقُولُ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَ ٱلنَّاسِ مَا وَلَّىٰهُمۡ عَن قِبۡلَتِهِمُ ٱلَّتِي كَانُواْ
عَلَيۡهَاۚ قُل لِّلَّهِ ٱلۡمَشۡرِقُ وَٱلۡمَغۡرِبُۚ يَهۡدِي مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٖ
مُّسۡتَقِيمٖ ١٤٢ وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَٰكُمۡ أُمَّةٗ وَسَطٗا لِّتَكُونُواْ
شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيۡكُمۡ شَهِيدٗاۗ وَمَا
جَعَلۡنَا ٱلۡقِبۡلَةَ ٱلَّتِي كُنتَ عَلَيۡهَآ إِلَّا لِنَعۡلَمَ مَن يَتَّبِعُ ٱلرَّسُولَ
مِمَّن يَنقَلِبُ عَلَىٰ عَقِبَيۡهِۚ وَإِن كَانَتۡ لَكَبِيرَةً إِلَّا عَلَى ٱلَّذِينَ
هَدَى ٱللَّهُۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَٰنَكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ
لَرَءُوفٞ رَّحِيمٞ ١٤٣ قَدۡ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجۡهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِۖ
فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبۡلَةٗ تَرۡضَىٰهَاۚ فَوَلِّ وَجۡهَكَ شَطۡرَ ٱلۡمَسۡجِدِ
ٱلۡحَرَامِۚ وَحَيۡثُ مَا كُنتُمۡ فَوَلُّواْ وُجُوهَكُمۡ شَطۡرَهُۥۗ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ
أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ لَيَعۡلَمُونَ أَنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّهِمۡۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ
عَمَّا يَعۡمَلُونَ ١٤٤ وَلَئِنۡ أَتَيۡتَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ بِكُلِّ
ءَايَةٖ مَّا تَبِعُواْ قِبۡلَتَكَۚ وَمَآ أَنتَ بِتَابِعٖ قِبۡلَتَهُمۡۚ وَمَا بَعۡضُهُم
بِتَابِعٖ قِبۡلَةَ بَعۡضٖۚ وَلَئِنِ ٱتَّبَعۡتَ أَهۡوَآءَهُم مِّنۢ بَعۡدِ
مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلۡعِلۡمِ إِنَّكَ إِذٗا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ١٤٥

﴿لرؤف رحيم﴾ بێگومانە کەخوا بەرامبەر بەخەڵك زۆر میهرەبان و دڵاواو بەبەزەییيە. پێغەمبەری خوا ﷺ لە ناو ژنە دیلەکاندا ئافرەتێکی دیت کەمنداڵەکەی لێ بەجێمابوو هەرمنداڵێکی دەدی دەیگووشی بەخۆیەوە، هەتا منداڵەکەی خۆی دۆزییەوەو توند گووشی بەخۆیەوەو مەمکەی خستە دەمی، ئەوجا فەرمووی: پێتان وایە هەرگیز ئەم ژنە ئەو منداڵەی خۆیە فڕێ دەداتە ناو ئاگرەوە؟ گوتیان: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا! ئەوسا فەرمووی: دڵنیابن کەخوا بەرامبەر بە بەندەکانی خۆی لەوە بەبەزەیی ترە. موسلیم:٤ /٢١٠٩.

**جوولەکە دەزانن ئەم ڕووگەیە ڕاستەو ، حاشاشی لێدەکەن!**

﴿[١٤٤] قد نرى تقلب وجهك في السماء﴾ بێ شك دیتمانی ئەی پێغەمبەر! کە بەرەو ئاسمان چاو دەگێڕیی ودەڕوانیی و پێتخۆشە روو بکەیتە کەعبە، جێگەی ئیبراهیم پەیامبەر ﴿فلنولينك قبلة ترضاها﴾ دەسا دڵنیابە، ئێمە ە نوێژەکاندا ڕووت بەرەو ڕووگەیەك وەردەگێڕین کەخۆت پێتخۆشە، واتە: (مەسجیدولحەرام). زاناکان دەڵێن: ئەمە مانای وایە کە ئەگەر چاوت لە کەعبەوە بوو، دەبێ لەنوێژدا بەرێك و پێکی رووی تێ بکەی، ئەگینا ئەگەر ڕوو لە هەرسوچێکی کەعبەیش بکەیت هەردەبێ و قەیناکات ﴿فول وجهك شطر المسجد الحرام﴾ جاتۆش ڕووت بەرەو (مزگەوت)ی(حرام) وەرگێڕە ﴿وحيثما كنتم فولوا وجوهكم شطره﴾ وە ئێوەش ئەی ئیمانداران! لەهەرکوێ بوون، دەبێ روو بکەنە لای (مەسجیدولحەرام)ەوە، بەڵێ جیاکردنەوەی موسڵمانان لەبیرو باوەڕدا، لە ڕووگەو خواپەرستییدا، دووکاری زۆر پێویستن بۆیان و، دەبێ مرۆڤی موسڵمان لەسەری راوەستێ ﴿وإن الذين أوتوا الكتاب﴾ و بەراستیی ئەوانەش وا نامەی ئاسمانییان پێدراوە، واتە: (گاور وجوولەکە) ﴿ليعلمون انه الحق من ربهم﴾ چاك دەزانن کە ئەو گۆڕانکارییە فەرمانێکی هەق وڕاستەو لەلایەن پەروەردگاریانەوەیە ولەکتێبەکانیشیاندا هەیەو ئاماژەی پێکراوە ﴿وما الله بغافل عما يعملون﴾ وخواش لەو چاوو ڕاو پروپاگەندەیە – سەبارەت بەو گۆڕانکارییە- کردیان بێ ئاگانییەو تۆڵەیان لێدەسێنێ ﴿[١٤٥] ولئن اتيت الذين أوتوا الكتاب بكل آية﴾ بەراستیی ئەر تۆ هەر نیشانەیەك بێنیی و نیشانی خاوەن نامەکانی بدەیت (هەتا باوەڕت پێبکەن) وشوێنت کەون و ڕووبکەنە ڕووگەکەت ﴿ما تبعوا قبلتك﴾ هەرگیز لەبەر ئێرەیی و عینادیی خۆیان، روو لە ڕووگەکەت ناکەن و پەیڕەویت ناکەن ﴿وما انت بتابع قبلتهم﴾ خۆدیارە ئەتۆش -پاش ئەوەی خوا ڕوویکردیتە کەعبە- ڕووناکەیتە ڕووگەی ئەوان ﴿وما بعضهم بتابع قبلة بعض﴾ ئەوانیش ڕووناکەنە ڕووگەی یەکترو پەیڕەوی لەیەکتر ناکەن، نە جوولەکە روو لەڕووگەی گاوران دەکا، نە ئەمانیش روو لەڕووگەی ئەوان دەکەن ﴿ولئن اتبعت أهواءهم من بعد ماجاءك من العلم﴾ دوای ئەو زانست و زانیارییە لەخواوە بۆت هات و، بە نیگاش بۆت دەرکەوت کە هەق و ڕاستیی لە ڕووگەکاندا کامەیە، گریمان ئەگەر تۆ لە هەواو هەوەسی ئەوان پەیڕەوی بکەی ﴿إنك إذا لمن الظالمين﴾ بێگومان ئەو کاتە لەریزی ستەمکاران دەبی ﴿[١٤٦] الذين آتيناهم الكتاب﴾ ئەوانە کتێب و نامەمان پێداون ﴿يعرفونه كما يعرفون ابناءهم﴾ چاك ئەو (پەیامبەر)ـە دەناسن و، هەرچیشی لەگەڵ خۆی هێناوە دەزانن ڕاستە، هەرچۆنێ منداڵ و کوڕانی خۆیان دەناسن. (عەبدوڵڵای کوڕی سەلام)ی جوولەکە، پاش موسڵمان بوونی، گوتی: بەڵێ.. ئەوقسەیە ڕاست و ڕەوایە، چونکە لە پەیامبەرێتی موحەممەد ﷺ هیچ گومانێکمان نیە، بەڵام دەگونجێ دایکی کوڕەکەم کارێکی خراپ و دزێوی کردبێ. ﴿وإن فريقا منهم ليكتمون الحق﴾ بەراستیی دەستەیەکیشیان نکووڵی ئەو هەقە دەکەن و ڕاستیی دەشارنەوە ﴿وهم يعلمون﴾ وچاکیش شارەزان و دەزانن کە: هەق و ڕاستیی کامەیە ؟ بەڵام لەبەر ئێرەیی وعینادی خۆیان باوەڕ ناهێنن! وەکو پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((إِنَّهُمْ لايَحْسُدُونَنَا على شَيْئٍ كَمَا يَحْسُدُونَنَا على يومِ الجمعةِ

التی هدانا الله لها وضلوا عنها، وعلى القبلة التی هدانا الله لها وضلوا عنها، وعلى قولنا خلف الإمام :آمين))
پێشەوا ئەحمەد. ﴿١٤٧ الحق من ربك﴾ ئەمە حەق وراستەو لە پەروەردگارتەوەیە، نەك بە ئارەزوو ودادخوازی کەسێك
بێت ﴿فلا تكونن من الممترين﴾ دەسا هەرگیز تۆ (ئەی موحەممەد!ﷺ)لە ریزی تاقمی دوودڵان و بەد، گومانان مەبە-
دیارە مەبەست بەم ئاراستەیە تەنها قەومو گەلەکەیەتیی و، هەڵنانی خۆشیەتی تاپتر سوور بێ لەسەر هەق ، ئەگینە
ئەو خۆی هەرگیز بەگومان ودوو دڵ نابێت.. بەڵێ دەبێ هیچ کات گوێ بۆ جوولەکەو گاورو بێ باوەڕەکانی تری
سەردەم نەگرین، چونکە هەمیشە خەریکی دروستکردنی جۆرەها گومان ودوودڵین لەناو جیهانی ئیسلامدا ﴿١٤٨
ولكل وجهة هو موليها﴾ هەر گەل و میللەتێك رووگەیەکیان هەیەو، رووی تێدەکەن، بەڵام ئێستا هەر قیبلەی ئێوە
پەسەندە، کەوابوو لەگۆڕانی قیبلە لە (صەخرە) بۆ کەعبە،
ئەوانە چ پشێویی وهەرایەك دروست دەکەن ؟ لەجێگایەکی
تردا دەفەرموێ: (لكل جعلنا منكم شرعة ومنهاجا ولو شاء
الله لجعلكم أمة واحدة ولكن ليبلوكم فيما آتاكم ..).
﴿فاستبقوا الخيرات﴾ کەوابوو ئێوە (ئەی موسڵمانان!) گوێ
بەوانە مەدەن و، هەمیشە هەوڵ بدەن و، بۆ کردنی هەموو
کارێکی خێر، پێشبڕکێ بکەن، دیارە ئەم قیبلەیەش یەکێکە
لەوکارە خێرانە ﴿اينما تكونوا يأت بكم الله جميعا﴾ لە هەر
جێگایەبن "دەشت و کێوو چۆڵ و بیابان" خوا هەموان دێنێ
و لەقیامەتدا کۆتان دەکاتەوە، ئەگەر چ جەستەشتان
لێکجیابێ، ئەوساش دەردەکەوێ کێ راستەو کێش درۆزن
﴿إن الله على كل شئ قدير﴾ چونکە بە راستیی خوا توانای
بەسەر هەموو شتێکدا هەیە ﴿١٤٩ ومن حيث خرجت فول
وجهك شطر المسجد الحرام﴾ تۆ لەهەرشوێنێك دەرکەوتی،
دەبێ لەنوێژدا رووله(مەسجیدولحەرام)بکەیت ﴿وإنه للحق
من ربك﴾ دڵنیاشبە روو لە کابەکردن راست و دروستەو
لەلایەن پەروەردگارتەوە بڕیاردراوە ﴿وما الله بغافل عما
تعملون﴾ و لەو کارو کردەش ئێوە دەیکەن، هەرگیز خوا بێ ئاگا نیە ﴿١٥٠ ومن حيث خرجت فول وجهك شطر
المسجد الحرام وحيثما كنتم فولوا و جوهكم شطره﴾ و لەهەرجێیەکەوە دەرچویت و هاتیتە دەرەوێ، دەبێ لەنوێژدا
ڕوو هەر لە ((مەسجیدولحەرام)) بکەیت، وەئێوەش ئەی موسڵمانان، لەهەر جێیەك بوون لەماڵەوە ، یان رێبوارو
راگوزەر بوون، دەبێ " لە نوێژدا رووتان هەر لە مزگەوتی(حەرام)ـەوە بێ. بەڵێ دووبارەو سێ بارە کردنەوەی
فەرمان بە ڕوو لە کابەکردن: ئەوە دووجار فەرمووی: (..فول وجهك..) جارێکی تر فەرمووی: (فولوا وجوهكم..)
بۆگرنگیی و بایەخدانە بە گۆڕانی ڕووگە لە (بيت المقدس)ـەوە بۆ کەعبە، بێجگە لەوەش ، ئەمەش دەگەیەنێ: کە چ
لەمەککە دابن، چ لە دەرەوەی مەککە، دەبێ لە نوێژدا روو هەر لە کەعبە، یان لە جیهەت و سووچی ئەوبکەن، واتە:
خۆ دەربازکردن نیە لەم بڕیارە ﴿لئلا يكون للناس عليكم حجة﴾ تا ئەو خەڵکەی جوولەکەو گاورە، هیچ بەڵگەیەکیان



ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَعْرِفُونَهُۥ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمْ ۖ وَإِنَّ
فَرِيقًا مِّنْهُمْ لَيَكْتُمُونَ ٱلْحَقَّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٤٦﴾ ٱلْحَقُّ مِن
رَّبِّكَ ۖ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴿١٤٧﴾ وَلِكُلٍّ وِجْهَةٌ هُوَ مُوَلِّيهَا ۖ
فَٱسْتَبِقُوا۟ ٱلْخَيْرَٰتِ ۚ أَيْنَ مَا تَكُونُوا۟ يَأْتِ بِكُمُ ٱللَّهُ جَمِيعًا ۚ
إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٤٨﴾ وَمِنْ حَيْثُ خَرَجْتَ فَوَلِّ
وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ۖ وَإِنَّهُۥ لَلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ ۗ وَمَا
ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿١٤٩﴾ وَمِنْ حَيْثُ خَرَجْتَ فَوَلِّ وَجْهَكَ
شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ۚ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ
شَطْرَهُۥ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَيْكُمْ حُجَّةٌ إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟
مِنْهُمْ فَلَا تَخْشَوْهُمْ وَٱخْشَوْنِى وَلِأُتِمَّ نِعْمَتِى عَلَيْكُمْ وَلَعَلَّكُمْ
تَهْتَدُونَ ﴿١٥٠﴾ كَمَآ أَرْسَلْنَا فِيكُمْ رَسُولًا مِّنكُمْ
يَتْلُوا۟ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِنَا وَيُزَكِّيكُمْ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلْكِتَٰبَ
وَٱلْحِكْمَةَ وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمْ تَكُونُوا۟ تَعْلَمُونَ ﴿١٥١﴾ فَٱذْكُرُونِىٓ
أَذْكُرْكُمْ وَٱشْكُرُوا۟ لِى وَلَا تَكْفُرُونِ ﴿١٥٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُوا۟ ٱسْتَعِينُوا۟ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٥٣﴾

دژی ئێوە بەدەستەوە نەبێ و نەڵێن: جائەگەر ئەم پەیامبەرە راست دەکات دەبوو ڕووی لە ڕووگەی ئیبراهیم کردبا ﴿إلا الذين ظلموا منهم﴾ مەگەر ئەوانەیان لاسارو ستەمکاربن، دیارە بڕوبیانووی ئەوانە هەر ئەمێنێ، بۆنموونە: جوولەکە دەڵێن: بۆیە ڕووی لەکەعبە کرد چونکە مەیلی بۆ قورەیش هەیە و، ئەوانی خۆش دەوێ، هاوبەشدانەرەکانیش دەڵێن: دوای گەڕانەوەی بۆ ڕووگەکەمان (کەعبە) چاوەڕووانی گەڕانەوەی خۆیشی دەکرێ بۆ ئایینەکەمان! ﴿فلا تخشوهم﴾ دەسا ئێوە لەو پیلانی ستەمکارانە مەترسن و، گوێ بۆ قسەشیان مەگرن ﴿واخشوني﴾ دەبێ هەر لەخۆم بترسن، لە من شەرم بکەن و" پەیڕەوی لەم پەیامبەرەی منە بکەن و، هەر لەسەر ئەو ڕووگە تازەیەش بن ﴿ولأتم نعمتي عليكم﴾ وە بۆ ئەوەی نازو نیعمەتی خۆمتان بۆ تەواو بکەم، چونکە ڕووکردن لە ڕووگەی ئیبراهیم و، پەیڕەوی لەئایینی ئەو، گەورەترین دەسکەوت و نیعمەتە ﴿ولعلكم تهتدون﴾ وە بەشکم شارەزای ڕێگەی راست ببن.

## ناردنی پێغەمبەر ﷺ شوکری دەوێت:

دوای ئەوە کەپتر لەسێیەکی سوورەتەکە، باسی نازونیعمەتەکانی هۆزی جوولەکەی کرد، ئێستاش دێتە سەر گفتوگۆ لەگەڵ موسڵمانەکانداو گەلێ نازو نیعمەتیان بۆ باس دەکا، یەکێ لەوانە هاتنی پێغەمبەرە ﷺ وەکو دەفەرموێ: ﴿[١٥١] كما أرسلنا فيكم رسولا منكم﴾ هەر وەکو ئەو نیعمەتی قیبلەیەم پێدان، هەرئاواش لەناو خۆتاندا پەیامبەرێکمان بۆناردن، واتە، هەر بۆ تەواوکردنی نیعمەتەکانم ئەو پێغەمبەرەشم بۆ ناردن ﴿يتلوا عليكم آياتنا﴾ ئایەتەکانی ئێمەتان بۆ دەخوێنێ ﴿ويزكيكم﴾ ولەهەموو خوویەکی ناپەسەند، دڵ و دەروونتان پاکژ دەکا ﴿ويعلمكم الكتاب والحكمة ويعلمكم مالم تكونوا تعلمون﴾ و قورئان وحیکمەت و فەرموودەکانیشتان فێردەکات، وچەند شتی واتان فێردەکا کە لەمەوبەر نەتاندەزانی ﴿[١٥٢] فاذكروني أذكركم﴾ دەسا ئێوە ئەی موسڵمانان! یادی من بکەن، تا منیش یادی ئێوە بکەم، پاداشتان بە چاکە بدەمەوە، لەفەرموودەیەکی رەواندا هاتووە: ((خوا دەفەرموێ :ئەوی لەدڵی خۆیدا یادم بکات، منیش لای خۆم نێوی دەبەم، هەرکەسیش لەناو کۆمەڵدا باسم بکات، منیش لەناو کۆمەڵێ باشتر لەوان-کۆمەڵی مەلائیکە- باسی دەکەم)). فتح الباري: ١٣ /٣٩٥. ﴿واشكروا لي ولا تكفرون﴾ وەدەبێ هەر سوپاسی من بکەن و، لە نیعمەتەکان حاشا مەکەن و، هەرگیز ناسپاسیم مەکەن وپشت لە بەرنامەکەم مەکەن، بەڵێ.. موسڵمانان تا بە تێرو تەسەلی سوپاس و یادی خوایان دەکردو، تەنیاو تەنیا ڕوویان لەڕووگەکەی ئەو دەکرد، خوایش سەری دەخستن و ناوی بەرزدەکردنەوە لەدنیادا. لە فەرموودەیەکدا هاتووە: ((من انعم الله عليه نعمة فإن الله يحب أن يرى أثر نعمته على خلقه)) پێشەوا ئەحمەد.واتە: کەخوا نیعمەتێکی بەکەسێك بەخشی، حەز دەکا بە بەندەکانیەوە دیاربێ.

## پەنا بەرنە بەر خۆڕاگریی و نوێژ:

﴿[١٥٣] يا أيها الذين آمنوا استعينوا بالصبر والصلاة﴾ ئەی گەلی خاوەن باوەڕ! پەنا بەرنە بەر خۆڕاگریی و نوێژ ، هەتا لەسەر قۆناغە گرژەکانی ژیانتان خۆڕا گربن، واتە: لەکاتی ناخۆشیی ونارەحەتییدا خۆڕا گربن و بەجوانی نوێژ بکەن، ئەوجا پاداشتان زۆر دەبێت، لە فەرموودەدا هاتووە: ((عجبا لأمرالمؤمن لايقضي الله له قضاء إلا كان له خيرا: إن أصابته سراء فشكر كان خيرا له ، وإن أصابته ضراء فصبر كان خيرا له)) موسلیم. ﴿إن الله مع الصابرين﴾ بێگومان خوا لەگەڵ ئارامگرانەو، لەگش گروفتێکا پشتگیریانەو سەریان دەخا، ئەگەرچی بەشەهید بوونیش بێت، پێشتریش فەرمووی: (واستعينوا بالصبر والصلاة وإنها لكبيرة إلا على الخاشعين)

## شەهید زیندووەو نامرێ!

﴿ ١٥٤ ولا تقولوا لمن يقتل في سبيل الله أموات﴾ بەوانە لەرێگای خوادا دەکوژرێن وشەهیدەبن ، مەڵێن مردوون ﴿بل أحياء ولكن لا تشعرون﴾ بەڵکو لە بەرزەخان وزیندوون، بەڵام ئێوە هەست بەوجۆرە ژیانەیان ناکەن، چونکە ژیانی ئەوان لە کارە نهێنیی و نادیارەکانی خوایە، بۆیە بێ چەندوچوون ملکەچبوون و تەسلیمبوون بە فەرموودەی خوای گەورە کارێکی پێویستە، چونکە قسەکردن لە بابەت جۆری ژیانی شەهیدەوە زیادەڕەویی و لە سنوور دەرچوونەو، بەتەواوی چۆنیەتییەکەی دەرك ناکرێ، بۆیە خوا ئەفەرموێ: ئێوە هەستی پێناکەن. لەفەرموودەیەکی(صەحیح)و باوەڕ پێکراودا هاتووە کە: شەهید لەلایەن خوای گەورەوە حەوت جۆرخەڵات دەکرێت:

١) هەر لەکاتی ڕژانی یەکەم دڵۆپی خوێنیەوە خوا لە تەواوی گوناحانی دەبورێ.

٢) لەبەهەشتدا پلەوپایەی خۆی دەبینێ.

٣) لە جەزرەبەو سزای گۆڕ پارێزراو دەبێ.

٤) ترسی نەفخەی دووەمی نابێ.

٥) بەجوانیی و زینەتی ئیمان ئەڕازێنرێتەوە.

٦) چەندین (حورەلعەین)ی پێ دەبەخشرێ.

٧) بۆ (٧٠)کەس لەخزم و کەس و کاری خۆی شەفاعەت دەکا. ترمزیی، ئیبن ماجە، پێشەوا ئەحمەد، و(ئەلبانی)یش بەرەوانی داناوە.

### موسڵمان دەبێ ئەزموون بکرێت:

﴿ ١٥٥ ولنبلونكم بشيء﴾ بێگومانبن جاروبار تاقیتان دەکەینەوە! ﴿من الخوف و الجوع ونقص من الاموال والأنفس والثمرات﴾ بە بەشێك لە ترس و برسیەتی و کەمکردنەوەو لەناوچوونی ماڵ و دارایی دنیا و زیانی گیانیی و تیاچوونی بەروو بوو و دەسکەوتەکانتان" واتە: دەبێ چاك بزانن سروشتی ڕێگەی جیهادو سەرکەوتن ئەمەیە کە: مرۆڤ بەیناو بەین تووشی ئەم جۆرە زیانە ڕواڵەتیانە دەبێ، بەڵام دەبێ بەئارام و خۆگربێت ﴿وبشر الصابرين﴾ دەسا تۆش ئەی موحەممەد! ﷺ بەوانە کەخۆڕاگرو بەئارامن مژدە بدە ﴿ ١٥٦ الذين إذا أصابتهم مصيبة﴾ ئەوانەی کە تووشی هەر بەڵاو نەهامەتیی و چورتمێك دەبن ﴿قالوا إنا لله وإنا إليه راجعون﴾ وخێرا دەڵێن: ئێمە هەرهی خواین و، ئەو دروستیکردوین و، دەرەنجامیش لەقیامەتدا هەر بۆلای ئەو دەچینەوە ﴿ ١٥٧ أولئك عليهم صلوات من ربهم ورحمة﴾ مژدەیان بدەرێ: دەکەونە بەر دروودو ڕەحمەتی پەروەردگاری خۆیان ﴿وأولئك هم المهتدون﴾ وشارەزاو ڕێنوێنکراو هەرئەوانن.



وَلَا تَقُولُوا لِمَن يُقْتَلُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتٌ بَلْ أَحْيَاءٌ وَلَٰكِن
لَّا تَشْعُرُونَ ﴿١٥٤﴾ وَلَنَبْلُوَنَّكُم بِشَيْءٍ مِّنَ الْخَوْفِ وَالْجُوعِ
وَنَقْصٍ مِّنَ الْأَمْوَالِ وَالْأَنفُسِ وَالثَّمَرَاتِ ۗ وَبَشِّرِ الصَّابِرِينَ
﴿١٥٥﴾ الَّذِينَ إِذَا أَصَابَتْهُم مُّصِيبَةٌ قَالُوا إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ
﴿١٥٦﴾ أُولَٰئِكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَاتٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ ۖ وَأُولَٰئِكَ
الحزب ٣ هُمُ الْمُهْتَدُونَ ﴿١٥٧﴾ ۞ إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِن شَعَائِرِ اللَّهِ
فَمَنْ حَجَّ الْبَيْتَ أَوِ اعْتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ
بِهِمَا ۚ وَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَإِنَّ اللَّهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ ﴿١٥٨﴾ إِنَّ الَّذِينَ
يَكْتُمُونَ مَا أَنزَلْنَا مِنَ الْبَيِّنَاتِ وَالْهُدَىٰ مِن بَعْدِ مَا بَيَّنَّاهُ
لِلنَّاسِ فِي الْكِتَابِ ۙ أُولَٰئِكَ يَلْعَنُهُمُ اللَّهُ وَيَلْعَنُهُمُ اللَّاعِنُونَ
﴿١٥٩﴾ إِلَّا الَّذِينَ تَابُوا وَأَصْلَحُوا وَبَيَّنُوا فَأُولَٰئِكَ أَتُوبُ
عَلَيْهِمْ ۚ وَأَنَا التَّوَّابُ الرَّحِيمُ ﴿١٦٠﴾ إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا وَمَاتُوا وَهُمْ
كُفَّارٌ أُولَٰئِكَ عَلَيْهِمْ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ
﴿١٦١﴾ خَالِدِينَ فِيهَا ۖ لَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ الْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ
﴿١٦٢﴾ وَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ ۖ لَّا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الرَّحْمَٰنُ الرَّحِيمُ ﴿١٦٣﴾

**صەفاو مەروە دوو دروشمی خوا پەرستین:**

بەڵێ لەپێشەوە لە باسی گۆڕانی رووگەدا ئەوەیگەیاند کە: مەککە جێگای حەج و چەرخەی دەوری ماڵی خوایە، جا (بوخاریی)و (موسلیم) لە (ئەنەس)ـەوە –خوایان لێ رازی بێ- دەڵێن: ئێمە لەسەرەتای هاتنی ئیسلامدا، هاتووچۆی نێوان (سەفاو مەروە)مان بەکارێکی جاهیلیی و حەرام دەزانی! تا خوای کارزان فەرمووی: ﴿[١٥٨] إن الصفا والمروة من شعائر الله﴾ بەراستیی هاتووچۆی نێوان (صەفاو مەروە) لە دروشم و نیشانەکانی ئایینی خوای گەورەن ﴿فمن حج البیت او اعتمر﴾ ئینجا هەر کەسێك چوو بۆ حەج و، زیارەتی ماڵی خوایکرد، یان هەربۆ بەجێهێنانی عومرە چووو عومرەی کرد ﴿فلا جناح علیه ان یطوف بهما﴾ هیچ گوناهێکی ناگات کە: هاتووچۆی نێوان هەردوو تەپۆڵکەکەی (صەفاو مەروە) بکا، واتە: ئەگەرچی کاتی خۆیشی هاوبەشدانەرەکان سەعی ئەو جێگایەیان کردبێ و، دەستیان بە بتەکاندا هێنابێ و ماچیان کردبن، ئەمڕۆ بەفەرمانی خوا بۆ ئێوە ڕەوایە تەوافیان بکەن ﴿ومن تطوع خیرا فإن الله شاکر علیم﴾ هەرکەسێکیش لە پەردەی خۆ بەکەم زانیندا هەر چاکەیەك بکا وتەوافی زیاتر ئەنجامبدا ، خواش پاداشی چاکەیان ئەداتەوەو، بەکردەوەیشیان زاناو ئاگایە.

**نەحلەتی خوا لەوانە حەق دەشارنەوە:**

دیسان هەر لەسەر دڵ پیسی و ناپاکیی خەڵکانی بێ باوەڕ وجوولەکە دەڕواو ئەفەرموێ: ﴿[١٥٩] إن الذین یکتمون ما انزلنا من البینات والهدی﴾ بەراستیی ئەوانەی ئەو بەرنامەو ڕێنمایە دەشارنەوە کە لەو کتێبەدا هەیە بۆ شارەزایی خەڵك ﴿من بعد مابیناه للناس فی الکتاب﴾ دوای ئەوەی لە (تەورات و ئینجیل)دا روونمان کردۆتەوە (وەکو سیفاتی پێغەمبەرو فەرمان بە بڕواهێنان پێی و..هتد ﴿اولئك یلعنهم الله﴾ خوا نەفرینیان لێ دەکا ﴿ویلعنهم اللاعنون﴾ و تەواوی نەفرینکەرانیش نەفرینیان لێ دەکەن.. دیارە ئەمە تایبەت نیە بە جوولەکەو گاورەکانەوە، ئەگەر چی لەبارەی ئەوانیشەوە هاتبێت، بەڵکو هەرکەسێك هەق و راستیی لەم ئوممەتەی پێغەمبەرە ﷺ بشارێتەوە، یان بیگۆڕێ وخەڵکی چەواشە بکا، ئەوانیش هەر بەر ئەونەفرین و نەحلەتە دەکەون. ﴿[١٦٠] إلا الذین تابوا واصلحوا وبینوا﴾ جگە لەوانە پەشیمان بوونەوە وئاکاری چاکیان کردوو، شاردراوەکەیان ئاشکرا کردەوەو دەریانخست ﴿فاولئك اتوب علیهم﴾ منیش لەمانە تەوبە وەردەگرم ولێیان خۆش دەبم ﴿وانا التواب الرحیم﴾ وهەر بۆخۆشم لەتەوبەکاران دەبوورم و، بەرامبەریان دلۆڤانم ﴿[١٦١] إن الذین کفروا﴾ ئەوانە کافرو بێ باوەڕن ﴿وماتوا وهم کفار﴾ و هەر بە کافری وبێ دینیش لەدنیا دەمرن ﴿اولئك علیهم لعنة الله والملائکة و الناس اجمعین﴾ دەکەونە بەر نەحلەت و نەفرینی خواو هەموو فریشتەو خەڵکان بە تێکرا ﴿[١٦٢] خالدین فیها﴾ لەو سزاو نەفرینەیشدا هەمیشە دووچارن و ئەمێننەوە ﴿لا یخفف عنهم العذاب﴾ سزایان سووک ناکرێ ﴿ولا هم ینظرون﴾ ومۆڵەتیش نادرێن بڕووبیانوویەك بۆ خۆیان بهێننەوە، (عومەری کوری خەتاب) وپێشەواکانی دوای ئەویش –خوا لەگشتیان رازیی– لە(قنووت)و وتارەکانیاندا نەحلەتیان لە کافران دەکرد" بۆیە ئێستاش بێ‌کێشەو هەرا زاناکان دەڵێن: نەحلەتکردن لەکافران بەشێوەیەکی گشتیی، رەوایە. جوولەکە لەهەمووشتێکدا تەسلیم وملکەچی زاناکانیان ببوون، تەنانەتی حەڵاڵ و حەرامیشیان هەربەدەست ئەوان بوو! دیارە خۆتەسلیمکردنی کوێرانەی ئاوا لەسەر حسابی دینی خوا ، هەڵەیەکی زۆر گەورەیە، چونکە ئەبێ تەنها خوای گەورە یاسای حەڵاڵ وحەرامی لابێ و، گوێ گرتن بۆ زانایانیش تەنها لە چوارچێوەی شەریعەتی ئیسلامدا دەبێ، بۆیە خوا فەرمووی: ﴿[١٦٣] والهکم إله واحد﴾ خواو پەرستراوی راستەقینەی ئێوە، هەر خوایەکی تاك وتەنیایە، واتە: هەرئەویش بۆی هەیە یاسای ژیان و بوونەوەر دەست نیشان بکاو، حەڵاڵ

وحەرامیش دابنێت ﴿لا إله إلا هو الرحمن الرحيم﴾ غەیرەز خۆی هیچ پەرستراوێکی تر شیاو وراست نیە، هەربۆخۆشی زۆر بەبەزەیی وبەخشندەو دلۆڤان و میهرەبانە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ناوەگەورەو پیرۆزەکەی خوا(إسم الله الأعظم) لەم دوو ئایەتەدایە: (وإلهكم إله واحد)، (ألم. الله لا إله إلا هو الحى القيوم). عارضة الأحوذى: باب الدعوات/٦٢/١٣ .

**بەڵگەی بوونی خوداو تاك و تەنیایی زۆرە:**

﴿[١٦٤] إن فى خلق السموات والأرض﴾ لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوییدا، بەو هەموو ئەستێرەو کاکەشان و چیاو دۆڵ و بەرزیی و نزمیەوە ﴿واختلاف اليل والنهار﴾ وجیاوازیی و گۆڕانکاریی و هاتوچۆی شەوو ڕۆژاندا، جاریٚ درێژ دەبنەوە، جارێکیش کورت ﴿والفلك التى تجرى فى البحر﴾ و لەو کەشتیانەشدا کە بەناو دەریاکاندا هاتووچۆ دەکەن ﴿بما ينفع الناس﴾ بۆ بەرژەوەندیی و قازانج بەخەڵك گەیاندن، ﴿وما انزل الله من السماء من ماء﴾ و لەو ئاوەدا خوای گەورە لە عاسمانەوە دەیبارێنیٚ ﴿فأحيا به الأرض بعد موتها﴾ ئینجا بەهۆی ئەو ئاوەوە زەویی دوای مردن و وشك هەڵگەڕانی زیندووکردەوە ﴿وبث فيها من كل دابة﴾ وهەموو جۆرە زیندەوەرێکی تیابلاوکردەوە ﴿وتصريف الرياح﴾ ولە جولانەوەو هاتووچوویێکردن و گەڕانی بایەکان، هەرجارەی بەشێوەیەك، جارێك سارد، جارێك گەرم، جارێك گەردەلوول ﴿والسحاب المسخر بين السماء والأرض﴾ وە لەو هەورانەش وا لەنێوان ئاسمان زەوییدا راگیراوو رامن ﴿لآيات لقوم يعقلون﴾ لە گشت ئەوانەدا چەندین نیشانەو بەڵگەی بە هێز هەیە بۆئەوانەی تێدەگەن و تێدەفکرێن و دەزانن ئەم هەموو شتانە خاوەنی یاساو رژێمێکن و، لەخۆیانەوە پەیدا نابن و روونادەن، بۆیە لە فەرموودەیەکدا هاتووە: ((ويل لمن قرأ هذه الآية فمج فيها)) واتە: دۆزەخ بۆئەوکەسەیە کەئەم ئایەتە ئەخوێنێتەوەو تەنها دەمی دەجوڵێتەوەو، کەڵکی لەماناکەی وەرناگرن" مەبەست لەو کەسانەیە کەتێنافکرێن و بیری لیٚ ناکەنەوە، هەتا خوا بدۆزنەوەو بەتاك وتەنیا بیپەرستن.

الجزء الثاني سورة البقرة

إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ
وَٱلْفُلْكِ ٱلَّتِي تَجْرِي فِي ٱلْبَحْرِ بِمَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ وَمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ
مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن مَّآءٍ فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ فِيهَا
مِن كُلِّ دَآبَّةٍ وَتَصْرِيفِ ٱلرِّيَٰحِ وَٱلسَّحَابِ ٱلْمُسَخَّرِ
بَيْنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ لَأٓيَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿١٦٤﴾ وَمِنَ
ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ ٱللَّهِ
وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ وَلَوْ يَرَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ إِذْ يَرَوْنَ
ٱلْعَذَابَ أَنَّ ٱلْقُوَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا وَأَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعَذَابِ ﴿١٦٥﴾
إِذْ تَبَرَّأَ ٱلَّذِينَ ٱتُّبِعُوا۟ مِنَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوا۟ وَرَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ
وَتَقَطَّعَتْ بِهِمُ ٱلْأَسْبَابُ ﴿١٦٦﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوا۟ لَوْ أَنَّ
لَنَا كَرَّةً فَنَتَبَرَّأَ مِنْهُمْ كَمَا تَبَرَّءُوا۟ مِنَّا كَذَٰلِكَ يُرِيهِمُ ٱللَّهُ
أَعْمَٰلَهُمْ حَسَرَٰتٍ عَلَيْهِمْ وَمَا هُم بِخَٰرِجِينَ مِنَ ٱلنَّارِ ﴿١٦٧﴾
يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ كُلُوا۟ مِمَّا فِي ٱلْأَرْضِ حَلَٰلًا طَيِّبًا وَلَا تَتَّبِعُوا۟
خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿١٦٨﴾ إِنَّمَا يَأْمُرُكُم
بِٱلسُّوٓءِ وَٱلْفَحْشَآءِ وَأَن تَقُولُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿١٦٩﴾

٢٥

**ڕێبەران و پەیڕەوانیان:**

ئینجا پاشەڕۆژی ئەوانە باسدەکا لەنیشانەکانی ئەم بوونەوەرە تێنافکرێن و شەریك بۆخوا دادەنێن! بۆیە دەفەرموێ: ﴿[١٦٥] ومن الناس من يتخذ من دون الله أندادا﴾ هەندیٚ لەم خەڵکە هەیە لەگەڵ ئەوەشدا تێنافکریٚ تاخوا بەتەنها بپەرستیٚ ، هێشتا چەند هاوتاو چەند هاوبەشێکی بۆ دادەنیٚ ﴿يحبونهم كحب الله﴾ خۆشیان دەوێن وەك خۆشەویستی خودا، واتە: ئەوانیش هەر ئەوەندە بت و بەرنامەکانیان خۆش دەویٚ ﴿والذين آمنوا أشد حبا لله﴾

ئەوانەش وا باوەڕیان هێناوە، خوایان لەهەموو شتێك زیاتر خۆش دەوێ ﴿ولو يرى الذين ظلموا إذ يرون العذاب أن القوة لله جميعا﴾ ئەوانە وا ستەمیانکردوو هاوبەشیان بۆ خوا دانا، کاتێ ئەو ڕۆژە سەخت و سزایە دەبینن کەلەقیامەتدا دووچاریان دەبێ، ئیتر چاك بۆیان دەردەکەوێ و دەزانن: کەهەرچی هێزو توانا هەیە هەرهەموو بۆخوایە ﴿وأن الله شديد العذاب﴾ و سزای خواش توندو قورس وسەختە، ئیتر ئەمڕۆ لەدنیادا لەو شیرك وسەر لێشێواوییە دەهاتنە دەرێ

﴿[١٦٦] إذ تبرأ الذين اتبعوا من الذين اتبعوا﴾ ئەوکاتە کەسەرۆك وپێشەواکان ، لەپەیڕەوانی خۆیان بێزار دەبن وحاشا دەکەن ﴿ورأوا العذاب وتقطعت بهم الأسباب﴾ کە بەچاوی خۆیان سزاکە دەبینن، هەموو پەیوەندیی وهۆیەکی نێوانیان پچڕا ولێکترازا " وە بەخزم وکەس وکارو گرۆهەکانیان هیچ هیوایەك نەما

﴿[١٦٧] وقال الذين اتبعوا﴾ شوێنکەوتووەکان بە سەرۆکە گومڕاکان دەڵێن: ﴿لوأن لنا كرة﴾ ئەگەر هەرتەنیا جارێ دەگەڕاینەوە سەردنیا ﴿فنتبرأ منهم﴾ ئەوسا ئێمەش یەخەمان لێهەڵدەتەکاندن وبەرائەتمان لێدەکردن ﴿كما تبرأوا منا﴾ وەك ئەمڕۆ ڕێبەرەکانمان خۆیان لەئێمە بەری کردو، حاشایان لێکردین ﴿كذلك يريهم الله أعمالهم حسرات عليهم﴾ خوا بەوشێوەیە کاروکردەی خۆیان نیشاندەداو دەبێتە کۆڵ و کەسەر بۆیان و لەئاگریشدان ﴿وما هم بخارجين من النار﴾ هەرگیزیش لەو ئاگری دۆزەخە دەرنایەن و ڕزگار نابن و، بەهەتاهەتاییش هاوڕێی دەبن. بەڵێ شوێنکەوتنی هەر تاغووتێکی ئەم دنیایە ئەنجامی هەربەمشێوەیە دەبێ لەم گفتۆگۆیەدا باسکرا، بۆیە زۆرپێویستە بزانین کێ هەڵ دەبژێرین و، کێ دەکەینە ڕابەرو سەرکردە؟

**پاك و ڕەوا بخۆن و ، بە شوێن شەیتاندا مەچن:**

﴿[١٦٨] يا أيها الناس كلوا مما في الأرض حلالا طيبا﴾

ئەی خەڵکینە! لەرزق و ڕۆزیی سەرزەمین حەڵاڵێکی پاك بخۆن، واتە: هەر خوای گەورە بپەرستن و، هەرشتێکیشی کردە خۆراکتان ، حەڵاڵەو بیخۆن، ئەوەیشی یاساغ کرد لێتان توخنی مەکەون ﴿ولا تتبعوا خطوات الشيطان﴾ هەرگیز بەشوێن هەنگاوەکانی شەیتانیشدا مەڕۆن وپەیرەویی لێ مەکەن ﴿إنه لكم عدو مبين﴾ ئەو دوژمنێکی ئاشکراتانە، دەسا وریابن، فریوتان نەداو نەتانخاتە ناوشیرك و کاری حەرامەوە، لەجێیەکی تردا دەفەرموێ: (إن الشيطان لكم عدو فاتخذوه عدوا إنما يدعو حزبه ليكونوا من أصحاب السعير).

﴿[١٦٩] إنما يأمركم بالسوء والفحشاء﴾ چونکە ئەو فەرمانتان پێدەدا هەر کاری خراپ و داوێن پیسی و، فەحشاو زینا بکەن ﴿وأن تقولوا على الله مالا تعلمون﴾ و هانیشتان دەدا شتی وا دەربارەی خوا بڵێن کە هەر زانیاریتان پێی نیە.

سُورَةُ البَقَرَة — الجُزْءُ الثَّانِي

وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّبِعُوا۟ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُوا۟ بَلْ نَتَّبِعُ مَآ أَلْفَيْنَا عَلَيْهِ
ءَابَآءَنَآ أَوَلَوْ كَانَ ءَابَآؤُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ شَيْـًٔا وَلَا
يَهْتَدُونَ ﴿١٧٠﴾ وَمَثَلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ كَمَثَلِ ٱلَّذِى يَنْعِقُ
بِمَا لَا يَسْمَعُ إِلَّا دُعَآءً وَنِدَآءً صُمٌّۢ بُكْمٌ عُمْىٌ فَهُمْ لَا يَعْقِلُونَ
﴿١٧١﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُلُوا۟ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقْنَٰكُمْ
وَٱشْكُرُوا۟ لِلَّهِ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴿١٧٢﴾ إِنَّمَا حَرَّمَ
عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةَ وَٱلدَّمَ وَلَحْمَ ٱلْخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ بِهِۦ
لِغَيْرِ ٱللَّهِ فَمَنِ ٱضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ إِنَّ ٱللَّهَ
غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٧٣﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ
ٱلْكِتَٰبِ وَيَشْتَرُونَ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا أُو۟لَٰٓئِكَ مَا يَأْكُلُونَ
فِى بُطُونِهِمْ إِلَّا ٱلنَّارَ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ
وَلَا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٧٤﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ
ٱشْتَرَوُا۟ ٱلضَّلَٰلَةَ بِٱلْهُدَىٰ وَٱلْعَذَابَ بِٱلْمَغْفِرَةِ فَمَآ
أَصْبَرَهُمْ عَلَى ٱلنَّارِ ﴿١٧٥﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ نَزَّلَ ٱلْكِتَٰبَ
بِٱلْحَقِّ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُوا۟ فِى ٱلْكِتَٰبِ لَفِى شِقَاقٍۭ بَعِيدٍ ﴿١٧٦﴾

لَيْسَ البِرَّ — ٢٦

**خوانەناسان کوێرانە شوێنی پێشینانیان کەوتن:**

﴿١٧٠ وإذا قيل لهم اتبعوا ما انزل الله﴾ هەرکە بە پەیڕەوانی شەیتان بوترێ: هەر پەیڕەوی قورئان وئەو بەرنامەیە بکەن ، خوا ناردوویەتیی و، هەرگیز بەقسەی شەیتان مەکەن ﴿قالوا بل نتبع ما ألفينا عليه آباءنا﴾ پاساو دێننەوەو دەڵێن: ئێمە هەر لەوە پەیڕەو دەکەین کە باب وباپیرانمان لەسەری بوون و پەیڕەویان کردووە ﴿أو لوكان آباؤهم لا يعقلون شيئا ولا يهتدون﴾ ئەگەرچی باب وباپیرانیشیان هیچیان لەراستە رێ نەزانیبێ و هیدایەت و رێنما نەبووبن؟ ئەوانەهەرشوێنیان دەکەون؟ بەڵێ شوێنکەوتن و چاولێکەریی لەباتڵ و پڕوپووچ، بەهیچ شێوەیە جێگەی قسەوباس نیە، کەچەندە کارێکی ناڕەواوخراپە، بەڵکو دەبێ هەرلە"هەق"و راستیی وحەقیقەت پەیڕەوی بکرێ‌و هەر ئەمەش کارێکی دروست‌و رەوایە ﴿١٧١ ومثل الذين كفروا﴾ نەقڵ‌و نموونەی ئەو کافرو بێ باوەڕانە ﴿كمثل الذي ينعق بما لا يسمع إلا دعاء ونداء﴾ هەر وەکو نەقڵ‌و نموونەی ئەو ئاژەڵەیە کە دەنگ دەدرێ بۆ رزگار کردنیان لەومەترسیانە دێنە رێیان، کەچی جگە لە خوڕین‌و دەنگێك شتێ ترنابیسن وتێناگەن، دیارە بێ باوەڕەکانیش "لە گێلی و شوێنکەوتنی باب و باپیرانیاندا بێ هیچ لێکۆڵینەوەیەك" وەکو ئەو مەڕو ئاژەڵەیە کە شوانێك دەنگی دەداو هیچ شتێك نابیسێ، جگە لە دەنگ و هاوارێك نەبێ، ئەمانیش هەرچەندە گوێیان لە قورئانەوە دەبێت، راستییەکەی وەرناگرن و نابیسن! ﴿صم بكم عمي فهم لا يعقلون﴾ ئەوکەسانە کەڕولاڵ و کوێرن، چونکە فام‌و ژیرییان لەدەست داوەو هیچ لەهەق حاڵی نابن، بۆیە بەکوێرانە دوای هەمووکەسێك دەکەون ﴿١٧٢ يا أيها الذين آمنوا كلوا من طيبات ما رزقناكم﴾ ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! لەو نیعمەتە پێماندان و کردمانە رۆزیتان ، کامی پاکە ئەوە بخۆن ﴿واشكروا لله إن كنتم إياه تعبدون﴾ و سوپاسی خواش بکەن، ئەر راستە تەنها ئەو دەپەرستن. واتە: گوێڕایەڵیی راستەقینەی ئەو بکەن، چونکە هەر شتێکتان بۆ حەڵاڵ دەکا، هەر شتێکیشتان لێ یاساغ ئەکات، هەر لە بەرژەوەندی ئێوەیە، دەسا ئێوەش زۆر بە ئەمەکبن و سوپاسی بکەن.

**بەناچاری نەبێ گۆشتی مردارەوە بوو ناخورێ:**

﴿١٧٣ إنما حرم عليكم الميتة والدم ولحم الخنزير﴾ خوای گەورە تەنها هەر ئەمانەی لێ یاساغکردوون: لاکی مردارەوە بوو، خوێنی رژاوو رەوان ، واتە: ئەو خوێنەی لەهەر ئاژەڵ و گیان لەبەرێك دێتەدەرێ و دەڕوا مەیخۆن. گۆشتی بەرازیش لەگەڵ هەموو شتەکانی تریدا هەروا﴿وما أهل به لغير الله﴾ وهەر ئاژەڵێکیش -کە بۆ سەربڕین- ناوی غەیری خوای لێ هێنرابێت، ئیتر لەبەر بت و جن و پاشاو دەسەڵاتداران سەرببڕدرێ، یان بۆخواو پاشا، یان بۆهەر شەخس‌و پیرێك ﴿فمن اضطر غير باغ ولا عاد﴾ بەڵام هەر کەسێ لەبەر ناچاریی‌و بێ ئارەزوو، هەر بە ئەندازەی پێویست بخوات وزیادە خۆری نەکات ﴿فلا إثم عليه﴾ هیچ تاوان و گوناهێکی ناگات، لە خواردنی ئەوشتانەدا، دیارە دەبێ بەو پێیە بێت ،زاناکان باسیان لێکردووە ﴿إن الله غفور رحيم﴾ بەراستیی خوا زۆر گوناحپۆش و دلۆڤان‌و میهرەبانە، ئەوەتە لەکاتی تەنگانەدا خواردنی حەرامتان بۆ حەڵاڵ دەکات.

**جوولەکە هەمیشە حەق دەشارنەوە:**

﴿١٧٤ إن الذين يكتمون ما انزل الله من الكتاب﴾ بێگومان کەسانێ کە ئەوەی خودا لەتەوراتدا ناردوویەتی- لەبەر بەرژەوەندی خۆیان و پارتەکەیان- کەتمانی دەکەن ودەیشارنەوە ﴿ويشترون به ثمنا قليلا﴾ و بەنرخ و بەهایەکی کەم دەیفرۆشن، واتە: هەق و راستییەکان لە مەردم دەشارنەوە، هەتالای سەرۆك ودەسەڵاتداران کەمێ دنیایان دەسکەوێ ﴿أولئك ما يأكلون في بطونهم إلا النار﴾ پڕ بەسکیان هەر ئاگر دەخۆن"، واتە: ئەو بەهاو نرخەیە

کە ئەوان دەیخۆن لەو پێناوەدا هەر ئاگرەو، دەرەنجام لەقیامەتدا ورگیان پڕدەکەن لەئاگر ﴿ولا یکلمهم الله یوم القیامة﴾ وخوا لە ڕۆژی قیامەتدا ، قسەیەکی خۆشیان لەگەڵ ناکاو، توڕەیە لێیان ﴿ولا یزکیهم﴾ و لەگوناح و تاوان پاکیان ناکاتەوەو لێیان خۆش نابێت ﴿ولهم عذاب الیم﴾ بەڵکو سزایەکی ئێش پێگەیەنەریشیان بۆ هەیە ﴿[١٧٥] اولئك الذین اشتروا الضلالة بالهدی والعذاب بالمغفرة﴾ ئەو سەرگەردانانە ڕێگای ڕاستیان بە گومڕایی و، لێخۆشبوونی خوایان بەسزا گۆڕییەوە، هەر ناوورسیفەتێکی پێغەمبەر لە تەورات هەبوو، جوولەکە لەخەڵکیان شاردەوەو گومڕا بوون ﴿فما أصبرهم علی النار﴾ دەبێ چۆن بتوانن لەسەر ئاگر خۆراگرن؟! ﴿[١٧٦] ذلك بأن الله نزل الکتاب بالحق﴾ چونکە خوا تەوراتی بەهەق نارد، بۆ ڕوونکردنەوەی حەقیقەت و ڕاستییەکان و دەرخستنی سیفەت و ڕەوشتەکانی پێغەمبەر ﷺ کە ئەوان شاردیانەوە ﴿وإن الذین اختلفوا فی الکتاب﴾ و بەڕاستیی ئەوانەش لەسەر ئەم کتێبە ئیختیلاف وجیاوازی و ناکۆکییان هەیە، واتە: جوولەکەو گاور، چونکە هەرئەوان بوون کە هەر شتێکیان بەدڵ بووبا دەریاندەخست وهەرشتێکیشیان بەدڵ نەبووبا دەیانشاردەوە ﴿لفی شقاق بعید﴾ لەدژایەتی و دووبەرەکییەکی ناجۆرو دوور و درێژدان و هەرگیز هەق وراستیی نادۆزنەوە، بۆیە شایستەی دۆزەخن. دەسائێوەش ئەی ئیمانداران ! وریابن! هیچ ڕاستییەك نەشارنەوە، چونکە شاردنەوەی هەر نیشانەو بەڵگەیەکی زانیاریانە بۆ بوونی خواو ڕاستیی وواقعیەتی ئیسلام، وە یان بۆ دروستیی و ڕاستیی بەرنامەی خوا، لەلایەن زاناکانەوە "لەهەر سەردەمێکدا" بەکەتمان و شاردنەوەی ڕاستیەکان دادەنرێ، وەبەر ئەو هەڕەشەیە دەکەون.

### هەر ڕێبازیی چاکە هەڵبژێرە:

﴿[١٧٧] لیس البر أن تولوا وجوهکم قبل المشرق والمغرب﴾ چاکەو چاکەکاریی هەر ئەوە نیە ئێوە -جولەکەو گاور- کاتی نوێژ- ڕوو لە خۆرهەڵات بکەن، یان خۆرئاوا، ئەگەر لەرووی گوێڕایەڵیەوە نەبێ بۆ فەرمانی خوا، دیارە ڕووکردنە "مەسجیدولحەرام"یش هەروایە ﴿ولکن البر من آمن بالله والیوم الآخر﴾ بەڵکو چاکەی ڕاست و دروست ئەمەیە کە باوەڕی ڕاستەقینەی بەخواو بەڕۆژی دوایی ﴿والملائکة والکتاب والنبیین﴾ و بەفریشتەو بەکتێبی ئاسمانی و بەپەیامبەرانی خوا هەبێ ﴿وآتی المال علی حبه ذوی القربی﴾ لەو ماڵ ودارایی یەش -هەرچەند خۆشەویستیش بێ لایان- بەشێکی بدەنە خزمەکانیان و دەستیان لێ نەنووقێنن و بێ بەشیان نەکەن ﴿والیتامی والمساکین وابن السبیل﴾ و بەشێ بدات بە منالانی هەتیو و، خەڵکانی بێ نەوا و ڕێبوار و، لەڕێگا جێماوانی بێخەرجی ﴿والسائلین وفی الرقاب﴾ و سواڵکەران" ئەوانەی ناچارن بەسواڵ و دەست پانکردنەوە" وەبە یەخسیران وکۆیلەکان، واتە: لەپێناو ئازادکردنی بەندەو دیلەکاندا ببەخشن ﴿وأقام الصلاة وآتی الزکاة﴾ و نوێژی تێرو

الجزء الثاني | سورة البقرة

حزب ٣

۞ لَيْسَ الْبِرَّ أَن تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَٰكِنَّ
الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالْكِتَابِ
وَالنَّبِيِّينَ وَآتَى الْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِ ذَوِي الْقُرْبَىٰ وَالْيَتَامَىٰ
وَالْمَسَاكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَالسَّائِلِينَ وَفِي الرِّقَابِ وَأَقَامَ
الصَّلَاةَ وَآتَى الزَّكَاةَ وَالْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَاهَدُوا
وَالصَّابِرِينَ فِي الْبَأْسَاءِ وَالضَّرَّاءِ وَحِينَ الْبَأْسِ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ
صَدَقُوا وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ ﴿١٧٧﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ
عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى الْحُرُّ بِالْحُرِّ وَالْعَبْدُ بِالْعَبْدِ وَالْأُنثَىٰ
بِالْأُنثَىٰ فَمَنْ عُفِيَ لَهُ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ فَاتِّبَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ وَأَدَاءٌ
إِلَيْهِ بِإِحْسَانٍ ذَٰلِكَ تَخْفِيفٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَرَحْمَةٌ فَمَنِ اعْتَدَىٰ
بَعْدَ ذَٰلِكَ فَلَهُ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٧٨﴾ وَلَكُمْ فِي الْقِصَاصِ حَيَاةٌ
يَا أُولِي الْأَلْبَابِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٧٩﴾ كُتِبَ عَلَيْكُمْ
إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْرًا الْوَصِيَّةُ لِلْوَالِدَيْنِ
وَالْأَقْرَبِينَ بِالْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى الْمُتَّقِينَ ﴿١٨٠﴾ فَمَن بَدَّلَهُ
بَعْدَمَا سَمِعَهُ فَإِنَّمَا إِثْمُهُ عَلَى الَّذِينَ يُبَدِّلُونَهُ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٨١﴾

٢٧

تەسەل بکات و، زەکاتی ماڵ بدات ﴿والموفون بعهدهم إذا عاهدوا﴾ وە هەر بەڵێن و پەیمانێك گرێ دەدەن بیبەنە سەرو هەڵی نەوەشێننەوەو وەفای پێ بکەن ﴿والصابرین فی البأسآء والضرآء وحین البأس﴾ و لەکاتی نەبوونیی و دەستکورتیی و نەخۆشیی و بەر بەرەکانێ لەگەڵ دوژمندا خۆ راگربن ﴿اولئك الذین صدقوا﴾ مرۆ راستەکان ئەوانەن ، پاش باوەرهێنان ئەو سیفەتانەیان تێدابێ "نەك تەنها بەڕوو کردنە خۆر هەڵات وەکو گاورەکان، یان خۆرئاوا وەکو جوولەکە.. لەولایشەوە هەرشتێ کە بەرژەوەندی خۆیانی تیابەدی نەکەن لە موسڵمانانی بشارنەوە ﴿واولئك هم المتقون﴾ ودیارە هەرئەوانەشن خواناس و پارێزگاری راستەقینە، چونکە بەکردارو رەفتاریش سەلماندیان کە بروایان هەیە و خۆپەرستنین و بۆ هەل ناگەڕێن.

**تۆڵە سەندنەوەو حیکمەتەکەی:**

﴿ [١٧٨] یاأیهاالذین آمنوا کتب علیکم القصاص فی القتلی﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕدارن! لە بارەی کوژراوانەوە، بەشێوەیەکی دادگەرانە و یەکسانیی و، بێ دەست درێژیی و زیادە رەویی (قیساس)وتۆڵەمان لەسەر داناون: ﴿الحر بالحر والعبد بالعبد والأنثی بالأنثی﴾ ئازاد لە بری ئازاد، بەندە لە باتی بەندە، مێینە لەتۆڵەی مێینە ﴿فمن عفی له من اخیه شئ﴾ ئینجا هەرکەسیش لەلایەن برای هاودینی خۆیەوە، واتە: لەلایەن کەس وکاری کوژراوەوە عەفوو چاوپۆشی لێکرا (لە کوشتنەوە)و، بەخوێن رازیی بوو ﴿فاتباع بالمعروف واداء إلیه بإحسان﴾ دەبا خوێن وەرگرەکە رێی چاك بگرێتە بەرو، بە پیاوانە و بەپێی باوونەریتی ناوچەکە رەفتار بکاو بجوڵێتەوە، لایەنی بکوژەکەش بەجوامێرانە ومەردانە خوێن بەکەس وکاری کوژراوەکە بدەن ﴿ذلك تخفیف من ربکم ورحمة﴾ ئەو لێبوردن وخوێن وەرگرتنە لەلایەن پەروەردگارتانەوە بارسووکیی و بەزەییەکە بۆتان، کاری وابۆ جولەکەو گاور نەکراوە. ﴿فمن اعتدی بعد ذلك﴾ دوای ئەم خوێنگرتن ولێبوردنە ، هەرکەسێك دەستدرێژیی کرد بۆسەر خوێندەرەکان ﴿فله عذاب الیم﴾ سزایەکی ئێش پێگەیەنەری بۆ هەیە، واتە: هەرکات بکوژ لەتۆڵەو قیساس عەفوو کرا، یان خوێنیدا، کەچی پاش ئەوە دەستدرێژی کرایە سەری، بێگومان ئەو دەستدرێژیکارەیە تووشی سزایەکی دەردناك دەبێ لەدنیاو لەقیامەتدا ﴿ [١٧٩] ولکم فی القصاص حیاة یا اولی الألباب﴾ ئەی خاوەنانی فام و ژیریی! لەم تۆڵە وەرگرتنەوەدا ژیانی خۆش ومەزنتان هەیە، واتە: ئەم یاسایە دەبێتە مایەی مانەوەی ژیانی مرۆڤ و، خۆ دوورگرتن لەکوشت وکوشتار، چونکە کابرای بکوژ بزانێ، کەسێ بکوژێ دەکوژرێتەوە، ئیتر دەسدرێژی بۆسەرگیانی ئەم و ئەوناکات ﴿لعلکم تتقون﴾ بەڵکو لەبەر ئەو یاسایە لەسنوورەکانی خوا خۆ بپارێزن، ئاسوودەیی و بەختیاریی بۆ وڵات وناوچەکەتان بگەڕێتەوەو خوێن رێژی نەکرێ.

**چەند روونکردنەوەیەك:**

١) تەنها دەوڵەت مافی وەرگرتنەوەی قیساس و تۆڵەی هەیە، پێویستە لەسەر موسڵمانان هەوڵبدەن دەوڵەتێکی ئیسلامیی وا دروست بکەن، بڕوای بە (قیصاص) بێ و بشتوانێ ئەنجامی بدا، بەتایبەت ئەمرۆ کەئەم جۆرە بڕیارانە لەدنیادا پشتگوێ خراون.

٢) جەماوەری زانایان یەکدەنگن بۆ کوشتنەوەی کۆمەڵە خەڵکێك" لەباتی کوشتنی تەنها کەسێك" ئەگەر هەموویان هاوبەش ببوون لە ئەنجامدانی کوشتنەکەدا، چونکە ئیمامی (عومەر) هەر حەوت کەسەکەی کوشت هاوبەشببوون و لە کوشتنی لاوێکدا، پاشان وتی: (لو تمالأ علیه أهل الصنعاء لقتلتهم، ولم یخالفه أحد فکان

إجماعا)واتە: ئەر خەڵکی (سەنعا)ی (یەمەن) گشت ئەریْ بکەن وبەشدار بن بۆ کوشتنی تەنیا کەسێك، هەموودەکوژمەوە، ئەوسایش هیچ کامێك لە هاوەڵان دژی ئەم قسەیە نەوەستان، کەواتە بۆتە (ئیجماع).

٣) هەندیْ لە زانایان پێیان وایە:پیاو لەباتی ژن ناکوژرێتەوە بەڵام جەماوەری زانایان ئەڵێن: پیاو بە ژن ئەکوژریْ.

٤) ئاخۆ باوك بەکوشتنی کوڕی خۆی دەکوژرێتەوە؟ بۆ ئەمەش جەماوەری زانایان دەڵێن: نەخێر، بەڵام پێشەوا (مالیك) بۆ ئەم وەڵامە روونکردنەوەیەکی هەیە: دەڵیْ هەرکاتیْ ئەو باوکە کوڕەکەی خۆیخست و سەری بڕی، دەکوژرێتەوە. خۆ ئەگەر بەردێکی بۆهەڵدا، وەیا دارێکی لێدا، وەیان بەئامێرێکی وا کوشتیی، کوشندە نەبوو، ناکوژرێتەوە، چونکە لەوە ناچیْ نییەتی کوشتنی بووبیْ، بێجگە لەوەش ئەم فەرموودەیە هاتووە: ((إدْرَؤُا الْحُدُودَ بالشبهات)). واتە: لە بەر هەر گومانێك بێت تۆڵەکان راگرن.

**وەسیەت بۆ باب و دایك و خزمان پێویستە:**

﴿[١٨٠] كتب عليكم إذا حضر أحدكم الموت﴾ لە سەرتان نووسراوە هەرکە کەسێکتان کەوتە سەرەمەرگ ﴿إن ترك خيرا الوصية للوالدين والأقربين بالمعروف﴾ و ماڵ و دارایەکی لە پاش بەجێما، دەبیْ بەشێوەیەکی پەسەند وەسیەت بکا کە باوك ودایك و خزمانی، هەرکەسە بەشی خۆی پێبگا، تاببێتە مایەی خۆشەویستیی و دڵخۆشکردنیان ﴿حقا على المتقين﴾ خەڵکانی خواناس وپارێزکار هەقە ئەم کارە بکەن، جا کەوابوو ئەوانەی لەخوا دەترسن، با باوك و دایك و خزمەکانیان لەمیرات بیْ بەش نەکەن ئەگەر چی هەشیان بێت بە هۆی کەسێکی ترەوە بەش بڕاو بووبیْ، وەك کوڕەزا بەکوڕ. بەڵیْ.. هەندیْ لەزانایان پێیان وایە: ئەم وەسیەتە بە ئایەتی میرات: (يوصيكم الله فى أولادكم..) سڕاوەتەوەو کاری پێناکرێت، چونکە دایك وباوك بە ئایەتی میرات بەشیان دیاریکراوە، بەڵام سەبارەت بەو خزمانە بەشە میراتیان پێنابڕیْ، سوننەتە وەسیەتیان بۆ بکاو لەمیراتەکە شتێکیان بدرێتیْ ، (تەبەریی) دەڵیْ: نەخێر، نەسڕاوەتەوەو کاری پیْ دەکریْ. بەروونتر بڵێین: (ئیبن عەباس، حەسەن، مەسرووق، تاووس، زەحاك، موسلیمی ئیبن یەسار، عەلای ئیبن زیاد، سەعیدی ئیبن جوبەیر، رەبیعی ئیبن ئەنەس، قەتادە، موقاتیلی ئیبن حیببان) گشت ئەم بەرێزانە دەڵێن: وەسیەت کردن بۆ ئەو کەس وکارە نزیکانە میرات نابەن، شتێکی هەقەو، بەئایەتی میراتیش لەبەین نەچووەو هەردەبیْ شتێکیان بۆ دیاریی بکریْ، لە سوورەتی(نیساء) ئایەتی(٨)داهاتووە: (وإذا حضر القسمة أولوا القربى واليتامى والمساكين فارزقوهم منه وقولوا لهم قولا معروفا). ﴿[١٨١] فمن بدله بعدما سمعه﴾ ئینجا هەرکەس دوای بیستنی وەسیەتەکە و ئاگادار بوونی ، بیگۆڕیْ و کاری پیْ نەکا ﴿فإنما إثمه على الذين يبدلونه﴾ ئەو کەسانە دەیگۆڕن تاوانبارن، وەسیەت کار گوناهێکی لەسەر نیە ﴿إن الله سميع عليم﴾ بەراستیی خوا زۆر بیسەرو زانایە، خۆی چاك دەزانیْ هەر دەستکاریەك بۆ رێکخستن بێت ، قەیناکاو پاداشی هەیە. ﴿[١٨٢] فمن خاف من موص جنفا او إثما﴾ هەرکات کەسیْ هەستی کرد کەوەسیەتکار لە وەسیەتەکەیدا ناهەق بووەو، خۆی تووشی گوناح کردووە ﴿فاصلح بينهم فلا إثم عليه﴾ هەوڵیدا میراتگرانی پێکبێنێت ، گوناحێکی ناگات ﴿إن الله غفور رحيم﴾ بەڕاستی خوا لەگوناه دەبووریْ و، بەبەزەیی و دلۆڤانە.

**رۆژووی مانگی ڕەمەزان:**

﴿[١٨٣] يا أيها الذين آمنوا﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! ﴿كتب عليكم الصيام﴾ بزانن رۆژووی مانگی رەمەزانتان لەسەر نووسراوەو فەرز کراوەتە سەرتان ﴿كما كتب على الذين من قبلكم﴾ هەروەکو لەسەر ئەوانەی

لەپێشتانەوە بوون بڕیاردراو نووسرا، دیارە هەر هۆزو ئوممەتێك ، جۆرێ ڕۆژووی بووە ﴿لعلكم تتقون﴾ بەڵكو بە
تەقوا بن و" سنوورەکانی خوا بپارێزن و دەرگای گوناح لەخۆ داخەن و، دەرگای هەموو خێرێ لەخۆ واز بکەن ﴿ ١٨٤
أياما معدودات﴾ چەند ڕۆژێکی ژمێرراوو دیاریکراوە، زۆر نیە ﴿فمن كان منكم مريضا أو على سفر﴾ ئینجا
هەرکەسێکتان نەخۆش بوو، ئەگەر ڕۆژووی گرتبا نەخۆشیەکەی زیادی دەکرد" وە یان درەنگ چاك ئەبوویەوە،
وەیان زۆری بۆدەهات و تەنگەتاو دەبوو، یان چووە سەفەر ﴿فعدة من أيام أخر﴾ ئەوجا ڕۆژووەکەیان شکاند، وەیان
هەر لەبنە ڕۆژەوە نەیانگرت ، دەبێ لەڕۆژانی تردا، چەند ڕۆژێ تر بە ڕۆژوو بنەوە ﴿وعلى الذين يطيقونه فدية طعام
مسكين﴾ و ئەو کەسانەش ناتوانن بەئاسانی بەڕۆژوو بن و، زۆر بەسەختی بۆیان دەگیرێ" ڕەك پیرو نەخۆشی
سەرجێگەو" ئافرەتی شیر دەروو، ژنی دووگیان" ئەوەپێویستە لەباتی هەر ڕۆژەی لە ڕۆژووەکە، خواردنی ژەمێ خۆراك" یا نرخەکەی بدەنە هەژارێ ﴿فمن تطوع خيرا﴾ ئەگەر کەسێك بە پێخۆشبوونی خۆی خۆراکی زیاتریدا ﴿فهو خير له﴾ ئەوە بۆخۆی باشە وقازانجی بۆخۆیەتی و، بەجیا پاداشی زیادەکەشی دەدرێتەوەو لای خوا وون نابێ ﴿وأن تصوموا خيرلكم﴾ خۆ لەگەڵ ئەوەشدا ، ئەربە ڕۆژووبن گەلێ چاکترە بۆتان ﴿إن كنتم تعلمون﴾ ئەگەر بتانزانیباو بتوانن.

الجزء الثاني — سورة البقرة

فَمَنْ خَافَ مِن مُّوصٍ جَنَفًا أَوْ إِثْمًا فَأَصْلَحَ بَيْنَهُمْ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٨٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٨٣﴾ أَيَّامًا مَّعْدُودَٰتٍ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ فَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُۥ وَأَن تَصُومُوا۟ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١٨٤﴾ شَهْرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلْقُرْءَانُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَٰتٍ مِّنَ ٱلْهُدَىٰ وَٱلْفُرْقَانِ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ وَلِتُكْمِلُوا۟ ٱلْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُوا۟ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٨٥﴾ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِى عَنِّى فَإِنِّى قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُوا۟ لِى وَلْيُؤْمِنُوا۟ بِى لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ﴿١٨٦﴾

أحل لكم — ٢٨

## چەند ئاگاداریيەك:

١) تاقمێ لە زانایانی پێشین (سەلەف) دەڵێن: هەر کەسێ لە سەرەتای مانگی ڕەمەزانەوە نیشتەجێ و(مقيم) بوو، لەپاشان چوویە سەفەر" بۆی نیە بە بیانووی سەفەرەکەیەوە ڕۆژووەکەی نەگرێ. (ئیبن کەسیر) ئەڵێ: ئەمە قسەیەکی (غەریب) و نە ناسراوە.

٢) دەستەیەك لە هاوەڵان ولە پاشینان دەڵێن: هەر کەسێ چوویە سەفەر" نابێ ڕۆژوو بگرێ.

٣) کۆمەڵێ لە زانایان دەڵێن: لەسەفەردا نەڕۆژوو گرتن و، نە شکاندنەکەی واجیب نیە، بەبەڵگەی فەرموودەی: (فَمِنَّا الصَائِمُ ومِنَّا الْمُفْطِرِ، فَلَمْ يَعِبِ الصَائِمُ على الْمُفْطِرِ، ولا المفطرُ على الصائم) فتح الباری.

٤) ئیمامی شافیعیی و دەستەیەکی تر دەڵێن: بە ڕۆژووبوون لەسەفەرا، لە شکاندنەکەی باشترە.

٥) کۆمەڵێکیش دەڵێن: بەڵکو نەگرتنی باشترە.

٦) تاقمێکی تریش دەڵێن: گرتن و نەگرتنی یەکسانە (دیارە ئەمانە هەرەیەکەیان بەڵگەی خۆیانیان هەیە).

٧) ئایا قەزا کردنەوەی ڕۆژوو هەردەبێ بەدەم یەکەوە بێ وبەینی نەکەوێ ؟ یا بەیناو بەین وبچڕبچڕ لە نێو مانگەکانیشدا دەبێ! ڕایەك دەڵێ: هەر دەبێ بە یەکەوە بێ و، بچڕبچڕ نەکرێ. ڕایەکی تریش ئەڵێ: نەخێر، قەزا کردنەوەی واجیب نییە بەدەم یەکەوە بێ.

٨) قسەی ڕاست ئەوەیە کە یەك شایەدی دادگەر بەسە بۆسەلماندنی (دیتنی مانگی یەك شەوەی ڕەمەزان، بەڵام بۆ چەسپاندنی دیتنی مانگی یەك شەوەی شەشەڵان" دەبێ دوو شایەت بن.

**گەورەیی و مەزنیی مانگی ڕەمەزان:**

پاشان خوای گەورە وەسپ وسەنای مانگی ڕەمەزان دەکاو دەفەرموێ: ﴿[١٨٥] شهر رمضان الذی أنزل فیه القرآن﴾ مانگی ڕەمەزان، ئەومانگەیە کە قورئانی تێدا نێردراوەتە خوارێ، واتە: لەڕەمەزاندا (دەست بەناردنی کراوە) ﴿هدی للناس﴾ ڕێنمایی مەردم دەکا بۆ گشت کارێکی چاك ﴿وبینات من الهدی والفرقان﴾ و چەندین بەڵگەو نیشانەی زۆر ڕوونی تێدایە بۆ شارەزای ڕێی هەق و، جیاکردنەوەی ڕاست و ناڕاست ﴿فمن شهد منکم الشهر فلیصمه﴾ ئینجا هەرکەسێکتان مانگی ڕەمەزانی بەسەرهات، وەرێبوارو نەخۆش نەبوو، بڕو بیانووی شەرعیشی نەبوو، دەبێ بەڕۆژوو بێت ﴿فمن کان منکم مریضا أوعلی سفر﴾ ئینجا ئەوکەسەشتان نەخۆش‌و لەش بەبارە، یا لەسەفەرەو ڕێبوارەو، ڕۆژووەکەشی دەشکێنێ ﴿فعدة من أیام أخر﴾ دەبێ لە ڕۆژانی دیکەدا، چەند ڕۆژێکی تر بەقەزا بگرێتەوە ﴿یرید الله بکم الیسر﴾ خوا ئاسوودەیی و کارئاسانی ئێوەی دەوێ ﴿ولا یرید بکم العسر﴾ و لەئەنجامدانی فەرزەکاندا، نایەوێ بکەونە تەنگیی و ناڕەحەتیی ﴿ولتکملوا العدة﴾ ودەیەوێ بەئاسانی ڕۆژووی ئەوماوە تەواوبکەن ﴿ولتکبروا الله علی ما هداکم﴾ و بەگەورەیی خوا بزانن وقایل بن، کە ئێوەی ڕێنماکرد ﴿لعلکم تشکرون﴾ پێویستە سوپاسی بکەن لەسەر ئەو مۆڵەتدانەو سەخت نەگرتنەی.

**خوا هاوارو نزای بەندەکانی دەبیسێ:**

(تەبەری) ئەڵێ: پیاوێکی دەشتەکی هاتە لای پەیامبەر ﷺ وگوتی:ئاخۆ خوا نزیك بێت، تا بەچپە وهێواش بانگی لێ بکەین ؟ یان دوورە تادەنگی لێ بەرز بکەینەوە؟ ئەوسا خوای گەورە فەرمووی: ﴿[١٨٦] وإذا سألك عبادی عنی فإنی قریب﴾ هەرکاتێ بەندەکانم لە بارەی من پرسیارت لێدەکەن: ئایا من دورم لێیانەوە یان نزیك ؟دەبێ بزانن ،من زۆر نزیکم لێیانەوە﴿أجیب دعوة الداع إذا دعان﴾ بەهاناو پاڕانەوەی دوعا گۆیانەوە دێم و وەڵامیان دەدەمەوە هەرکە لێم وەپاڕێن ﴿فلیستجیبوا لی﴾ دەبا ئەوانیش فەرمان و داخوازی من وەڵام بدەنەوەو، فەرمانەکانم پشتگوێ نەخەن ﴿ولیؤمنوا بی﴾ وباوەڕی تەواو بتەویان بەمن هەبێ ﴿لعلهم یرشدون﴾ بەشکو ڕێی ڕاست بۆخۆ بەدی بکەن. بەڵێ.. پاڕانەوەو نزاو لاڵە لەدەرگای پەروەردگاردا بناغەی بڕواو دڵسۆزی نیشان دانە، بۆیە پەیامبەران بایەخێکی زۆریان بەدۆعا دەدا. لەفەرموودەی قودسیدا هاتووە: ((أنا عند ظن عبدی بی وأنا معه إذا دعانی)) پێشەوا ئەحمەد. لە فەرموودەیەکی(متفق علیه)یشدا هاتووە: ((یُسْتَجَابُ لِأَحَدِکُمْ مَالَمْ یَعجَلْ: یَقُولُ:دَعَوْتُ فَلَمْ یُسْتَجَبْ))

**سەرجێیی ژنان و ئاوو خۆراك لە شەوانی ڕەمەزاندا:**

(تەبەریی) ئەڵێ: موسڵمانانی پێشوو نەدەبوو لە مانگی ڕەمەزانا " دوای نوێژی خەوتنان" ئاوو خواردن بخۆنەوەو بشچنە لای ژنەکانیان، ئینجا هەندێکیان (وەك عومەری کوڕی خەتتاب) ئەم سنوورەیان بۆ نەپارێزرا، ئەوجا بەناچاری ئەوکارەی خۆیانیان بۆ پەیامبەر ﷺ باسکرد، ئەوسا بۆچارەسەری ئەوە، خوای گەورە فەرمووی: ﴿[١٨٧] أحل لکم لیلة الصیام الرفث إلی نسائکم﴾ چوونە لای ژنانتان و تێکەڵاوی کردن لەگەڵیاندا لە شەوانی ڕەمەزان بۆتان ڕێدرا ﴿هن لباس لکم﴾ چونکە ئەوان پۆشاك وجلکن بۆئێوە" هەر ئەبێ تێکەڵییان بکەن و، پێکەوەش بژێین ، خۆ بێ ئەوانیش ناتوانن ئارام بگرن" ﴿وأنتم لباس لهن﴾ ئێوەیش جل وپۆشاکی ئەوانن" دیسان خۆراگرتن بۆ ئەوانیش هەر قورس و گرانە" ﴿علم الله أنکم کنتم تختانون أنفسکم﴾ بەڕاستیی خوا بۆ خۆی ئەیزانی کە ئێوە

هەرگیز خۆتان پێ ناگیردرێ و ئەوسنووره دەشكێنن و، لەگەڵ خێزانەكانتانا دروست ئەبن ﴿فتاب، عليكم﴾ بۆیە بەو پەشیمان بوونەوەتان تۆبەی لێ وەرگرتن ﴿وعفا عنكم﴾ و چاوپۆشی لێكردن و لێتان خۆش بوو ﴿فالآن باشروهن﴾ ئیتر هەر لە ئێستاوە ئازادن ودەتوانن بچنەلایان ﴿وابتغوا ما كتب الله لكم﴾ وئەوەش خوا لە.چارەتانی نوسیوە لەنەوەو زارۆڵەی چاك داوای بكەن. واتە: دەبێ ئەو تێكەڵاوییە" تەنها بۆ رابواردن نەبێت، بەڵكو دەبێ نیازی پەیدابوونی منداڵو زیادبوونی وەچەشی لەگەڵ بێت" ﴿وكلوا واشربوا﴾ دەسا بەدرێژایی شەوگار بخۆن و بخۆنەوەو، بچنەلای خێزانەكانتان ﴿حتى يتبين لكم الخيط الأبيض من الخيط الأسود من الفجر﴾ هەتا ئەوكاتە هەودای سپیایی دەمەوبەیان لەنێو هەودای رەشی شەو لەرۆژهەڵاتەوە دەردەكەوێ و جیائەبێنەوە." (بوخاریی) ئەڵێ: ئەوانەی وا ئەیانویست رۆژوو بگرن تاڵە دەزوویەكی سپی یان بە قاچێكیانەوە دەبەست و، تاڵێكی رەشیش بە قاچەكەی تریانەوە، ئیتر تا ئەوانەیان لێك جیانەكردایەتەوە دەستییان لەخواردن هەڵنەئەگرت، ئەوسا بۆروونكردنەوەی ئەم كارە ئەو ئایەتە هاتوو، پێغەمبەر ﷺ تێی گەیاندن كە: مەبەست هەوداو رشتەی شەوو رۆژە، نەك دەزووی سپیی ورەش. ئیمامی (موسلیم) یش ئەم فەرموودەیەی هێناوە ((لايغرنكم من سحوركم اذان بلال ولا هذا البياض: الأفق المستطيل هكذا حتى يستطير هكذا وأشار بيده يعنى معترضا). ﴿ثم اتموا الصيام إلى اليل﴾ لە پاشان رۆژوووەكەتان ببەنە سەرو تەواوی بكەن" هەرلە شەبەقەوە تا شەودێتو خۆرئاوا دەبێت" ﴿ولا تباشروهن وانتم عاكفون فی المساجد﴾ بەڵام ئەو كاتەی كە لەمزگەوتدا مات دەبنو خەریكی ئیعتیكاف دەبن تێكەڵی ژنانتان مەكەن"واتە: چوونە لای ژنانتان لە تەواوی شەوەكانی رەمەزان و غەیری رەمەزاندا بۆتان ڕەوایە، مەگەر كەسێك لە مزگەوتدا نیەتی ئیعتیكاف و خەڵوەی هێنابێ ، دیارە نابێ ئەو كەسەیە بەهیچ شێوەیەك لە ژنەكەی نزیك بێتەوە" ئەگینە ئیعتیكافەكی هەڵدەوەشێتەوە" ﴿تلك حدود الله فلا تقربوها﴾ ئەمانە باسكران گشت سنووری خوان ، دەسا ئێوەیش لێیان نزیك مەبنەوەو" ئەو سنوورانە مەشكێنن" ﴿كذلك يبين الله آياته للناس﴾ ئا بەو شێوەیە خوا نیشانەو بەڵگەكانی خۆی بۆ مەردم رۆشن ئەكاتەوە ﴿لعلهم يتقون﴾ بەڵكو خۆ بپارێزن و لەهەواو ئارەزوو پەیرەوی نەكەن و دووربكەونەوە.

**ئیعتیكاف:** خۆ دابڕینە لە خەڵك و مانەوەیە لەمزگەوتی جامیعە، پێغەمبەریش ﷺ گەلێ جار ئەو كارەی ئەنجام داوە، بەتایبەت لە دە رۆژی كۆتایی مانگی رەمەزاندا" بەلای كەمیەوە دەبێت شەوو رۆژێك لەمزگەوتدا بمێنێتەوە" شیاوی باسە بۆ ئەوەی نوێژەكەی هەینیشی بكات دەبێ هەر لە مزگەوتی جامیعەدا بمێنێتەوە.



أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ ٱلصِّيَامِ ٱلرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمْ هُنَّ لِبَاسٌ
لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَخْتَانُونَ
أَنفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنكُمْ فَٱلْـَٔـٰنَ بَـٰشِرُوهُنَّ
وَٱبْتَغُوا۟ مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمْ وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ
ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ مِنَ ٱلْفَجْرِ ثُمَّ أَتِمُّوا۟ ٱلصِّيَامَ
إِلَى ٱلَّيْلِ وَلَا تُبَـٰشِرُوهُنَّ وَأَنتُمْ عَـٰكِفُونَ فِى ٱلْمَسَـٰجِدِ
تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَقْرَبُوهَا كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ ءَايَـٰتِهِۦ
لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿١٨٧﴾ وَلَا تَأْكُلُوٓا۟ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم
بِٱلْبَـٰطِلِ وَتُدْلُوا۟ بِهَآ إِلَى ٱلْحُكَّامِ لِتَأْكُلُوا۟ فَرِيقًا مِّنْ
أَمْوَٰلِ ٱلنَّاسِ بِٱلْإِثْمِ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١٨٨﴾ يَسْـَٔلُونَكَ
عَنِ ٱلْأَهِلَّةِ قُلْ هِىَ مَوَٰقِيتُ لِلنَّاسِ وَٱلْحَجِّ وَلَيْسَ ٱلْبِرُّ
بِأَن تَأْتُوا۟ ٱلْبُيُوتَ مِن ظُهُورِهَا وَلَـٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنِ ٱتَّقَىٰ
وَأْتُوا۟ ٱلْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَٰبِهَا وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ
تُفْلِحُونَ ﴿١٨٩﴾ وَقَـٰتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَـٰتِلُونَكُمْ
وَلَا تَعْتَدُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿١٩٠﴾

## خواردنی ماڵی یەکتر بە ناڕەوا حەرامە:

﴿١٨٨ ولا تأكلوا أموالكم بينكم بالباطل﴾ سامان و دارایی یەکتر بە ناڕەواو نادروست لەنێو خۆتاندا مەخۆن، بەڵێ: دانانی یاسا و بەرنامە بۆ پاراستنی ماڵ و دارایی و شێوەی خەرج کردنی ، ئەگەرچی هی خۆیشت بێت شتێکی زۆر پێویستە ﴿وتدلوا بها إلى الحكام﴾ مەیشیدەن بەحاکمان و کاربەدەستان ﴿لتأكلوا فريقا من أموال الناس بالإثم﴾ تا بەناڕەوا بەشێك لە ماڵ و دارایی مەردم بخۆن ﴿وانتم تعلمون﴾ بۆ خۆشتان چاك دەزانن کە ئەو جۆرە کارانە نادروست و ناڕەوان.. بەڵێ ئیش وکاری پارێزەرو "موحامی"یەکانیش زۆر نزیکە لەم هەڕشەیەوە، جا ئەگەر فریای خۆیان نەکەون و زۆر راست وهەقڕەو نەبن، ئەوا بەزوویی تێدەکەون، بۆیە دەبێ هەرلەسەرەتاوە داوای پڕوو پووچ و بێجێ وەرنەگرن وتۆمار نەکەن و بەرگریی لێ نەکەن، خۆ بە بڕیاری حاکمەکانیش نەحەرام حەڵاڵ دەبێ، نەحەلاڵیش حەرام دەبێ، هەر لەبەر ئەوەبوو ئەو ئایەتەی سەرەوە هات، ئەم فەرموودەش کە (ئوممی سەلەمە) هێنای رایگەیاند: ((ألا إنما أنا بشر، وإنما يأتيني الخصم، فلعل بعضكم أن يكون الحن بحجته من بعض, فَأَقْضِيَ لَهُ، فَمَنْ قَضَيْتُ لَهُ بِحَق مُسلم فَإِنَما هِيَ قِطْعَةٌ من نارِ، فَلْيَحْمِلْها أَوْ لِيَذَرْها)) متفق عليه. واتە: بزانن " کاتێ کێشەیەك دێتە لام بۆ بڕانەوەی" وادەبێ هەندێ لەو کێشەدارانە لێزانترن لەهەندێکی تریان، ئەوجا منیش بەپێی ئەو بەڵگەیە بڕیاری خۆم دەدەم، دەسا بزانن ئەوی من بڕیاری مافی موسڵمانێکی بۆ دەدەم "لەواقیعدا هی ئەویش نیە" ئەوە پارچە ئاگرێکم بۆ دابڕیوە، ئەوسا ئیتر خۆی دەزانێ وەریدەگرێ، یا دەستی لێهەڵدەگرێ.

## مانگ نوێ بوونەوە:

﴿١٨٩ يسئلونك عن الأهلة﴾ لەبارەی مانگ نوێبوونەوەش پرسیارت لێدەکەن ئەی موحەممەد ﷺ و دەڵێن: بۆچی لەسەرەتاوە زۆر باریك وبچووکە، لەپاشان وردە وردە گەورە دەبێ و، پڕدەبێتەوە، بۆ دواییش بچووك ئەبێتەوە، ئەوسا بۆماوەیەك لە چاو ون ئەبێ؟ ﴿قل هي مواقيت للناس والحج﴾ پێیان بڵێ: ئەی پێغەمبەر!ﷺ کە ئەو مانگە هیلال و نوێیە بەوشێوەیە دەیبینن، بۆ زانین ودیاریکردنی کاتەکانی خواپەرستیی و راگرتنی ئاماری ساڵ ومانگەکانە بۆ ڕێکوپێك کردنی ژیانی خەڵك و، دۆزینەوەی مانگی بەرۆژوو بوون و، زانینی کاتی چوونە حەج. (بەراء) ئەڵێ: ئەم ئایەتەی (وأتوا البيوت ..)ـە لەبارەی ئێمەی (ئەنصار)ـەوە هات، چونکە هەرکاتێ کەسێکمان حەجی کردباو بهاتبایەتەوە، دەبوو لەدەرگاوە نەچووبایە ماڵەوە! جا ڕۆژێ پیاوێکمان کاتێ گەڕایەوە لەحەج، گوێی بەوە نەداو لەدەرگاوە چوویە ماڵەوە! ئەوسا بۆدوایی خەڵکەکەمان لێیان کردە هەرا! جا بۆ ڕەتکردنەوەی ئەو هەرایە، ئەم ئایەتە هات. پێشەوا بوخاریی. ﴿وليس البر بأن تأتوا البيوت من ظهورها﴾ واش چاك نییە ئێوە لە پشتەوە بچنە ناو ماڵەکانەوە بەتایبەت کە ئیحرام ئەبەستن وحەج ئەکەن، جاکاتێ ئەگەڕێنەوە لەسەربانەوە ئەڕۆنە ژوورەوە! ﴿ولكن البر من اتقى﴾ بەڵکو کاری چاك وپەسەند ئەوەیە کە لە سنوورەکانی خوا خۆبپارێزن ﴿وأتوا البيوت من أبوابها﴾ دەسا ئێوە لەدەرگاوە بێنە ماڵەکانتانەوەو، واز لەوکاری خۆتانە بێنن ﴿واتقوا الله لعلكم تفلحون﴾ لە خوا دەبێ هەموو کات بترسن و بۆهەموو کارێك لە دەرگای خۆیەوە بچنە ژوورەوە، تا بەڵکو بەختیارو بەختەوەرو ڕزگاربن لە هەردوولا.

## لەگەڵ شەڕ فرۆشاندا بجەنگن:

﴿[١٩٠] وقاتلوا فى سبيل الله الذين يقاتلونكم﴾ ئیوەش لەراهی خودا لەگەڵ ئەوکەسانەدا بجەنگێن کە لەگەڵتان بە جەنگ دێن و، ئەیانەوێ لە سەردانی ماڵی خوا ڕێتان لێ بگرن، ئەگەرچی لە مانگە خاوەن ڕێزەکان " الأشهر الحرم "یشدا بێت ﴿ولا تعتدوا إن الله لا يحب المعتدين﴾ بەڵام وریابن! نابێ دەست درێژیی وزیادەڕەوی بکەن لەکاتی رووبەڕووبوونەوەو جەنگدا، کێ جەنگی لەگەڵ کردن هەر لەگەڵ ئەوەدا بجەنگێن.. چونکە بەراستیی خوا دەست درێژکارانی خۆش ناوێت جا کەوابوو ئێوە دەست پێشخەر مەبن لەجەنگدا، خۆئەگەر کەسێکیشتان لەجەنگدا کوشت جەستەکەی تێك مەدەن و ناشیرین و بێ ڕێزی مەکەن و، لچ ولێوو لووتی مەبڕن ﴿[١٩١] واقتلوهم حيث ثقفتموهم﴾ و لە هەرشوێنێکیش دەستدرێژکەرانتان دەست کەوت و دەسەڵاتتان هەبوو بەسەریاندا ئەگەرچی لە زەوی (مزگەوتی حەرام)یشدا بن بیان کوژن ﴿واخرجوهم من حيث اخرجوكم﴾ لەو شوێنەش دەریانپەڕێنن کە ئێوەیان لێدەرپەڕاند، واتە: وەکو ئەوان لەمەککە ئێوەیان دەرکرد، دەئێوەش لەوێ ئەوان دەرکەن ﴿والفتنة اشد من القتل﴾ خۆ فیتنەنانەوەو وەیشوومە گێڕان وعەزیەت دانی موسڵمانانیش بەوجۆرە نامرۆڤانە بۆئەوە لەئایینی خۆیان پەشیمانیان بکەنەوە زۆر لەکوشتن خراپترەو، واتە: ئەگەر کەسێك کوشتنی بێ باوەڕانی لاناڕەحەت بێت، بێگومان عەزیەت و ئەشکەنجە دانی موسڵمانەکان زۆر گەورەترو قورسترە ﴿ولا تقاتلوهم عند المسجد الحرام حتى يقاتلوكم فيه﴾ ئێوە لەسنووری مەسجیدولحەرامدا نابێ جەنگیان لەگەڵ بکەن مەگەر ئەوان لەوێ جەنگتان لەگەڵ بکەن، واتە: هەرکەسێك لەوکافرانە رۆیشتە کەعبەوە، ئیتر نابێ دەستی بۆ ببرێ، مەگەر ئەو دەست بکاتەوە ﴿فإن قاتلوكم فاقتلوهم﴾ جا ئەگەر ئەوان لەگەڵتان جەنگان، ئێوەیش جەنگیان لەگەڵ بکەن و بیان کوژن ﴿كذلك جزاء الكافرين﴾ سزاو تۆڵەی کافرو بێ باوەڕان هەر ئاوایە.

الجزء الثاني | سورة البقرة

وَاقْتُلُوهُمْ حَيْثُ ثَقِفْتُمُوهُمْ وَأَخْرِجُوهُم مِّنْ حَيْثُ أَخْرَجُوكُمْ وَالْفِتْنَةُ
أَشَدُّ مِنَ الْقَتْلِ وَلَا تُقَاتِلُوهُمْ عِندَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ حَتَّىٰ يُقَاتِلُوكُمْ
فِيهِ فَإِن قَاتَلُوكُمْ فَاقْتُلُوهُمْ كَذَٰلِكَ جَزَاءُ الْكَافِرِينَ ﴿١٩١﴾ فَإِنِ انتَهَوْا
فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٩٢﴾ وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ
الدِّينُ لِلَّهِ فَإِنِ انتَهَوْا فَلَا عُدْوَانَ إِلَّا عَلَى الظَّالِمِينَ ﴿١٩٣﴾ الشَّهْرُ الْحَرَامُ
بِالشَّهْرِ الْحَرَامِ وَالْحُرُمَاتُ قِصَاصٌ فَمَنِ اعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا
عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَعَ
الْمُتَّقِينَ ﴿١٩٤﴾ وَأَنفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ
وَأَحْسِنُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ ﴿١٩٥﴾ وَأَتِمُّوا الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلَّهِ
فَإِنْ أُحْصِرْتُمْ فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ وَلَا تَحْلِقُوا رُءُوسَكُمْ حَتَّىٰ يَبْلُغَ
الْهَدْيُ مَحِلَّهُ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ بِهِ أَذًى مِّن رَّأْسِهِ فَفِدْيَةٌ
مِّن صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ فَإِذَا أَمِنتُمْ فَمَن تَمَتَّعَ بِالْعُمْرَةِ إِلَى الْحَجِّ
فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ فِي الْحَجِّ وَسَبْعَةٍ
إِذَا رَجَعْتُمْ تِلْكَ عَشَرَةٌ كَامِلَةٌ ذَٰلِكَ لِمَن لَّمْ يَكُنْ أَهْلُهُ حَاضِرِي
الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ ﴿١٩٦﴾

٣٠ | الحج أشهر

### چەند تێبینی یەك:

١- هەندێ جار پێویست دەکات دوژمن بەخۆی نەزانێت کتوپڕ هێرشی بۆبکرێت، دەشکرێ لەو هێرشەدا هەندێ ژن و منداڵ و خەڵکانی بێ تاوان پێوە بن ، ئایا حوکمی شەریعەتی ئیسلام لەمەدا چی یە؟ وەڵام: ئەگەر هیچ ڕێگایەکی تر نەبێت بۆ بەرپەرچ دانەوەی هێرشەکانیان و بۆ زاڵبوون بەسەر دوژمناندا بەوجۆرە نەبێ، زاناکان دەڵێن: هێرشی ئاوا ڕەوایەو هیچ گوناهێکی لەسەر نییە.

٢- گەلێ جار بەناچاری بە تۆپ و جۆرەها چەکی تری قورس و کوشندە هێرش دەبرێتە سەر دوژمن، لەهەمان کاتیشدا شارو دێهات و مزگەوت و قوتابخانە وخەستەخانەکانیش بەر زیان دەکەون، ئایا حوکمی ئیسلام بۆ ئەوە

دەبیٚ چی بیٚت ؟ وەڵام: ئەگەر خوانەناس و کافرەکان ئەوجۆرە چەکانەیان بەکارهیٚنا، ئەوا ئیٚمەیش بەناچاری بەکاری دیٚنین، بەڵام تابکریٚ دەبیٚ لەوشویٚنانە دەستپاریٚزی بکریٚ.

﴿[١٩٢] فإن انتهوا فإن الله غفور رحيم﴾ خۆ ئەگەر ئەوان جەنگیان وەستان و دەسبەردارتان بوون، ئەوە بیٚگومان خوا زۆر پۆشەری گوناهانە، دلۆڤان و میهرەبانە ، تا بەڵکو بگەریٚنەوەو بڕواش بیٚنن ﴿[١٩٣] وقاتلوهم حتى لاتكون فتنة﴾ لەکوشتنیان کۆڵمەدەن هەتا ئاژاوە و فیتنە لەناو دەچیٚ و، هیٚزو توانایشیان نامیٚنیٚ عەزیەت و ئازاریشتان بدەن و، بۆخۆیان سەرشۆڕو ریسوا دەبن ﴿ويكون الدين لله﴾ ئایین و دین و بەرنامەی ژیان ، هەر بەرنامەو دینی خوا دەبیٚ و، زاڵیش دەبیٚ بەسەر گشت بەرنامەکانی تردا ﴿فإن انتهوا فلا عدوان إلا على الظالمين﴾ ئینجا ئەگەر ئەوان دەسبەردار بوون و کۆتاییان بەشیرك هیٚناو، کوڵیان بەدوژمنایەتی و کاری نامەردانەیان دا، ئیتر هیچ دوژمنایەتییەك بەرامبەریان نییە، مەگەر لەسەر ئەوانەیان ستەمەکارو شەڕفرۆشبن، هەرکاتیٚکیش ئەمانە دەستیان لەناهەقیی وبیٚ باوەڕی هەڵگرت، ئیتر لەگەڵ ئەوانیشدا جەنگ ناکریٚ.

### لە مانگە حەرامەکاندا بیٚ هۆ جەنگ ناڕەوایە :

پیٚغەمبەری خوا ﷺ و موسڵمانەکان لە ساڵی شەشەمی کۆچییدا چوون بۆ عومرە ، بەڵام موشریکەکان ریٚیان لیٚگرتن بچنە ناو شاری مەککەوە وعومرەکەیان بکەن، ئەمەش لەمانگی (زیقەعدە)دا بوو، دیارە ئەمیش یەکیٚکە لەمانگە قەدەغەکراوەکان ونابیٚ جەنگی تیٚدابکریٚ، بۆیە لەگەڵیاندا ریٚککەوت کەئەمساڵ بگەریٚتەوەو ساڵی ئایندە بیٚتەوە عومرەکەی بکات، ئیمامی ئەحمەد دەڵیٚ: پیٚغەمبەرﷺ هەرگیز لەمانگە حەرامەکاندا جەنگی نەکردووە، مەگەر شەڕی پیٚفرۆشرا بیٚ، ئەوسا خوا فەرمووی: ﴿[١٩٤] الشهر الحرام بالشهر الحرام والحرمات قصاص﴾ مانگی حەرام بەمانگی حەرام و، شکاندنی ریٚزی هەرخاوەن ریٚزیٚکیش تۆڵەی هەیە، واتە: ئەگەر ئەوان لەمانگە قەدەغەکراوەکاندا لەگەڵتان بەجەنگ بیٚن، ئیٚوەیش بۆتان هەیە لەگەڵیان بجەنگیٚن وحەقی بەرگریتان هەیە ﴿فمن اعتدى عليكم﴾ ئینجا هەرکەسیٚك دەست دریٚژی کردەسەرتان ودەستی پیٚش خست ﴿فاعتدوا عليه بمثل ما اعتدى عليكم﴾ ئیٚوەش هەربە ئەندازەی ئەو دەست بکەنەوە لیٚی، واتە: بیٚ زیادە ڕەوی تۆڵەی خۆتان بکەنەوە ئەگەرچی مانگی قەدەغەکراویش بیٚ ﴿واتقوا الله واعلموا أن الله مع المتقين﴾ وە لە خوا ترستان هەبیٚ و پاریٚز بکەن و، چاکیش بزانن کە بەراستیی خوا لەگەڵ پاریٚزکارانەو هەمیشەیش پشتگیرییان لیٚ ئەکات، واتە: ئەگەر لەلایەن ئەوانەوە بەچەك وتەقەمەنی قورس وگازی ژەهراوی لیٚتان درا، ئیٚوەش بەناچاری بەهەمان چەك و تەقەمەنی وەڵامیان بدەنەوە زیادەڕەو مەبن.

### ماڵ لە ڕیٚی خوادا ببەخشن:

﴿[١٩٥] وأنفقوا في سبيل الله﴾ تادەتوانن گیان و سامانی خۆتان لەریٚی خوادا بەخت بکەن، واتە: هەمووجۆرە چەك و پیٚداویستییەکی جەنگ بکڕن وخۆتانی بۆ ئامادەبکەن ﴿ولا تلقوا بأيديكم إلى التهلكة﴾ خۆشتان بە دەستی خۆتان بەفەتەرات مەدەن، ، بەم شیٚوەیە کە دارایی نەبەخشن و دەست لە جیهاد هەڵبگرن ﴿وأحسنوا إن الله يحب المحسنين﴾ و خیٚرو چاکە بکەن، بەراستی خوا ئاکار چاکانی خۆش دەویٚ. (حوزەیفە) ئەڵیٚ: ئایەتی (وأنفقوا في سبيل الله..) لە بارەی ئینفاق و بە خششەوە لەریٚی خوادا هات (بوخاری)، ریوایەتیٚکی تردەڵیٚ: لەودەمەدا هەندیٚ کەس بەهەڵە مانای ئەم ئایەتەیان کرد، ئائەبووئەیوبی ئەنصاریی وتی: مانای ئەو ئایەتە بەهەڵە مەکەن، چونکە لەبارەی ئیٚمەوە هات، ئەوەبوو کەدوای سەرکەوتنی ئیسلام ودەسەڵات بەدەستگرتنی هەندیٚ لەخەڵکەکەمان وتیان:

ئێمە ئەوماوەیە زیانێکی زۆرمان دیتووە لەبەردینی ئیسلام وئێستاش ئیسلام سەرکەوتووە، چاك وایە ئێمەش دەس بکەین بەپڕکردنەوەی کەم وکوڕییەکانی رابووردوومان و بۆخۆمان دانیشین وبحەوێینەوە! جا خوای گەورەش ئەو ئایەتەی ناردو تێیگەیاندن کە: ئەوکارەی ئێوە خۆڵەناو بردن و وازهێنانە لە جیهاد، سەیری کتێبی (الصحیح المسند/ من اسباب النزول) بکە.

## چەند تێبینی یەك:

١- ئەگەر مۆڵەتی دوژمن بدرێت دەست پێش بخات، لەوانەیە زیانی گەورەمان لێبداو سەرنوتمان بکات، دە ئایا بۆمان ڕەوایە ئێمە دەست پێش بخەین؟ وەڵام: بەڵێ.. لە هەل ومەرجێکی ئاوادا هیچ گومان و دوودڵی نییە کە پێش ئەوان دەستی خۆمان بوەشێنین.

٢- دوژمن لە زیان گەیاندن و زیادەڕەوی دەست ناگێڕێتەوە مەگەر بەوە کە لەماڵ ومنداڵی بدرێ، ئایا لە هەل و مەرجێکی ئاوادا کاری وەها ڕەوایە؟ بەڵێ کاتێ کە دوژمن دەستپارێزی نەکاو لە هێرشەکانی واز نەهێنێ بەوە نەبێ کە لە ماڵ و منداڵی بدرێ، دیارە لە کاتی ئاوادا بە ناچاری لە ماڵ ومنداڵیان دەدرێ و باخ و باخاتیشیان دەسوتێنرێ.

٣- جەنگەکانی پەیامبەرو هاوەڵان، بە شێوەیەکی گشتیی بەرگری لە عەدالەت وراستیی بووە، چونکە ئەوان لە سەرەتاوە بە بەڵگەو نیشانە خەڵکیان بانگ دەکرد بۆلای ئیسلام، خۆئەگەر هێزێك نەیهێشتبێ و هەڕەشەی لە بانگبەرەکانی کردبێ، ئەمانیش بۆ پاراستنی گیانی بانگبەرەکانی وەڵامیان داوەتەوە، بێگومان هەموو ئەوجەنگانە هەر لە ئەوە بوون، نەك بۆ ئەوە کە بە زۆر خەڵکی موسڵمان بکرێت، ئایەتی: (أفأنت تكره الناس حتى يكونوا مؤمنين) باشترین بەڵگەیە بۆ ئەو راستیە. جا کەوابوو ئەگەرلە بانگەوازەکەمان ڕێ گیراو، هەڕەشەش لە بانگبەرەکانمان کرا، ئەوا ئێمەیش شیریان لێ هەڵدەگرین و کاری خۆمان ئەکەین.

## حەج و عومرە بە کاملی بە جێ بێنن:

پاش باسکردنی ڕۆژوو و، پاشانیش جیهاد، ئێستاش باسی حەج وعەمرە دەکات ودەفەرموێ: ﴿[١٩٦] وأتموا الحج و العمرة لله﴾ هەربۆ خوا حەج وعومرە بەچاکی وبەتەواوی ئەنجام بدەن، واتە ئەگەر نیازی هەریەك لەوانەتان کرد، دەبێ زۆر بەرێك وپێکی جێبەجێیان بکەن وتەنها نیەتی خوایان لێ بێنن ﴿فإن احصرتم فما استيسر من الهدى﴾ ئینجا ئەگەر هەر ڕێگەشیان نەدان بچنە حەج، یان عومرە، ئابلۆقەی دوژمن کران، وەیان نەخۆشیی ڕێی پێ نەدان و نەتانتوانی ئەرکەکانیان تەواو بکەن، ئەوسا چەندە دەتوانن ئاژەڵ بکەنە قوربانیی ولە ئیحرام بچنە دەرێ، چونکە پەیامبەریش ﷺ ئەوکاتە کە لەساڵی ڕووداوی حودەیبیەدا ڕێگەیان پێگرت، قوربانی دا و ئیحرامی شکاند ﴿ولا تحلقوا رؤسكم حتى يبلغ الهدى محله﴾ وە نابێ سەرتان بتاشن، و ئیحرام بشکێنن هەتا ئاژەڵی قوربانی و هەدیەکانتان نەگاتە جێگەی دیاریکراوی خۆی، واتە: لەو جێگایەدا کە ڕێتان لێگیراوە، ئەو جێگایە حەرەم بێت، یان دەرەوەی حەرەم دەبێ ئێوەیش هەر لەوێ قوربانیەکانتان سەر بڕن ﴿فمن كان منكم مريضا﴾ ئینجا هەرکەسێکتان نەخۆش و لەش بەبار بوو ﴿اوبه اذى من رأسه﴾ وە یان برین و ئازارێکی لەسەردا بوو ناچار بوو سەری بتاشێ ﴿ففدية من صيام او صدقة او نسك﴾ ئەبێ یەکێ لەم کەفارەت وبریتییانە بدات، واتە: ئەگەر کەسێ پێش ئەوە قوربانییەکەی بگاتە جێگەی خۆی، ویستی سەری بتاشێ، ئەبی سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بێت، وە یان سەدەقەو خێرێك بکات (کە خۆراکی شەش هەژارە)، وەیان مەڕێك یان بزنێك بکاتەخێر هەر لەوێدا ﴿فإذا امنتم﴾ ئینجا

هەرکاتێ ترستان لە دوژمن نەما، وەیان لە نەخۆشی ئاسووودە دڵنیا بوونەوە، ﴿فمن تمتع بالعمرة إلى الحج﴾ ئەوجا هەر کەسێك لە سەرەتاوە ئیحرامی بەعەمرە بەست و ئەرك وئەرکانەکانی بەجێ هێناو، پاشان ویستی بەهرە ببا لە عومرە و تەمەتوع بکا هەتا کاتی ئیحرام بە حەج بەستن، ئینجا ئیحرامی بە حەج بەستەوە ﴿فما استیسر من الهدی﴾ چ حەیوانێکی لە دەست دێ دەبێ بیکاتە قوربانی ﴿فمن لم یجد﴾ ئەوجا هەر کەسێك بۆی نەکراو دەستی نەرۆیشت ﴿فصیام ثلاثة أیام فی الحج﴾ دەبێ لەباتی ئەوە -بەرلەڕۆژی عەرەفە- سێ ڕۆژان لە ڕۆژەکانی حەج، بەڕۆژوو بێت ﴿و سبعة إذا رجعتم﴾ وحەوت ڕۆژیش هەرکە گەڕانەماڵەوە ﴿تلك عشرة کاملة﴾ بەمە دەبێتە دە ڕۆژی تەواو، دەسا ئێوەش ئەمە پشتگوێ نەخەن ﴿ذلك لمن لم یکن أهله حاضری المسجد الحرام﴾ ئەو تەمەتوع و ئیحرام بە عومرە بەستنە، ئینجا بە حەج، ئەو کەفارەتەش بۆکەسێکە کە خۆی و ماڵو منداڵی نیشتەجێی(مەککە)و مەسجیدولحەرام نەبن، واتە: خەڵکی دەرەوەی حەرەم بێت، ئەوسا موتعەی بۆهەیە، چونکە خەڵکانی مەککە زۆر بەئاسانی حەج وعومرە دەکەن، بۆیە ئەو ڕووخسەتەیان بۆ نییە. هەرکاتێکیش بەبۆنەی نەخۆشییەوە گەمارۆ دران ونەیانتوانی حەج، یا عومرە تەواو بکەن، هەمیسان بۆیان نییە قوربانی بکەن ولە ئیحرام بێنەدەرێ، بەڵکو هەردەبێ بەهەرجۆرێ بۆیان دەکرێ هەموو پایەکانی حەج وعومرە تەواوبکەن. ئیمامی (مالیك) وئیمامی(شافیعی) دەڵێن: (موحسەر/ واتە: ڕێلێگیراو) بەنەخۆشی، نابێ قوربانی بداو لە ئیحرام بێتەدەرێ، بەڵکو ئەگەر ساڵێکیشی پێ بچێ هەردەبێ بەو ئیحرامەوە بمێنێتەوە تا تەواف دەکات، بەڵام زانایانی تر دەڵێن ئەویش وەك (موحسەر)ی تر وایە. ﴿واتقوا الله واعلموا أن الله شدید العقاب﴾ دەبێ بەچاکی لەخوا بترسن و، باش بزانن کەبەڕاستیی خوا لەتۆڵەسەندا توندو تیژو سەختگیرە، دەسا هیچکاتێ سەرپێچی لێنەکەن و بەرنامەکەی نەگۆڕن.

الجزء الثاني | سورة البقرة

ٱلْحَجُّ أَشْهُرٌ مَّعْلُومَٰتٌ فَمَن فَرَضَ فِيهِنَّ ٱلْحَجَّ فَلَا رَفَثَ
وَلَا فُسُوقَ وَلَا جِدَالَ فِي ٱلْحَجِّ وَمَا تَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ
يَعْلَمْهُ ٱللَّهُ وَتَزَوَّدُوا۟ فَإِنَّ خَيْرَ ٱلزَّادِ ٱلتَّقْوَىٰ وَٱتَّقُونِ
يَٰٓأُو۟لِي ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٧﴾ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن
تَبْتَغُوا۟ فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ فَإِذَآ أَفَضْتُم مِّنْ
عَرَفَٰتٍ فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ عِندَ ٱلْمَشْعَرِ ٱلْحَرَامِ
وَٱذْكُرُوهُ كَمَا هَدَىٰكُمْ وَإِن كُنتُم مِّن قَبْلِهِۦ
لَمِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿١٩٨﴾ ثُمَّ أَفِيضُوا۟ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ
ٱلنَّاسُ وَٱسْتَغْفِرُوا۟ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٩٩﴾
فَإِذَا قَضَيْتُم مَّنَٰسِكَكُمْ فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ كَذِكْرِكُمْ
ءَابَآءَكُمْ أَوْ أَشَدَّ ذِكْرًا فَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن
يَقُولُ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنْيَا وَمَا لَهُۥ فِي ٱلْءَاخِرَةِ مِنْ
خَلَٰقٍ ﴿٢٠٠﴾ وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنْيَا
حَسَنَةً وَفِي ٱلْءَاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿٢٠١﴾
أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ نَصِيبٌ مِّمَّا كَسَبُوا۟ وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿٢٠٢﴾

٣١

## مانگەکانی ئیحرام بەحەج:

﴿[١٩٧] الحج اشهر معلومات﴾ گەرمەی حەجکردن چەند مانگێکی دیاریکراون، ئەمەیش هەرلە ئیبراهیمەوە عليه السلام هەتا ئێستا هەر وابووە، واتە: کاتی ئیحرام بەحەج بەستن تەنها مانگی شەشەلآن و ناوجەژنان وەدە ڕۆژەی سەرەتای مانگی حەجە، کەوابوو پێش ئەوانە یادوای ئەوانە ئیحرام بەحەج دانامەزرێ. ﴿فمن فرض فیهن الحج﴾ ئینجا هەرکەسێ بڕیاریدا لەو مانگانەدا حەج بکاو، ئیحرامیشی بۆ بەست ﴿فلا رفث ولا فسوق ولاجدال فی الحج﴾ دەبێ چاك بزانێت کە توخونی ژنان کەوتن و بەدکاریکردن و ناو وناتۆرە لێکهەڵدان ودەمەقاڵێ و قرە لەگەڵ یەکتر کردن و شەڕو هەرا لەحەجدا نین، واتە: دەبێ دەست لەو کردەوانە هەڵگرێ، هەتا ڕێزی ماڵی خواو، ڕێزی کارو کردەوەکانی

حـەج و عومرەی تیا دەرکـەویٚ ﴿وما تفعلوا من خير يعلمه الله﴾ دڵنیاشبن هـەر کا ێکی چاك ئەنجام بدەن خوا دەیزانیٚ و ئاگادارە پێی، کەوابوو لە هەموو کاتا خێرخوازو ئاکارچاکبن، بە تایبـەتی لەکاتی حەجدا ﴿وتزودوا فإن خير الزاد التقوى﴾ دەسا هەوڵ بدەن توٚشەو زادی سەفەری حەجتان ئامادە بکەن تا لە ڕێگاوباندا دەست لەمەردم پانکەنەوە و، ئاتاج و موٚتاج نەبن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چاکترین زەخیرەو توێشوو بوٚتان تەقوا، پارێزگارییە لە دەستپانکردنەوە لـە خـەڵك و، دوور کەوتنـەوە لـە گونـاح. (ئیبن عـەباس) ئـەڵێت: (یەمـەنی)یەکان دەهاتنـە حـەج و لەماڵەوە توٚشەیان هەڵنەئەگرت و دەیانگوت: ئێمە خەڵکێکین تەوەکولمان بە خوایەو پاڵمان بەوەوە داوەو پەکمان ناکەویٚ، جا کاتیٚ ئەگەیشتنە (مەدینە) ئاتاج و موٚتاج دەکەوتن و پەنایان بەم و بەو دەبردو دەستیان دەدایە سواڵ! ئەوسا ئایەتی: (وتزودوا...) هات و هەڵەکەی بوٚ راستکردنەوە. ئیمامی بوخاریی. ﴿واتقون يا أولي الألباب﴾ ئەی خاوەنانی ئاوەزوو بیر! دەبیٚ لە یاساکانی من پارێز بکەن واتە: فەرمانەکانم جێبە جیٚ بکەن و سەرپێچی مەکەن.

**بازرگانی لە سەفەری حەجدا ڕەوایە:**

بوخاریی لە(ئیبن عەباس)ـەوە ئەڵیٚ: لەسەردەمی جاهیلیەتدا لـە بازاڕەکانی: (عوکازو، میجەننەو، زولمەجاز)دا خەڵك کوٚ دەبوونەوە بوٚ بازرگانی، جاکاتیٚ ئیسلام هات ئەو کارەیان بە گوناح دادەنا و، نەدەبوو بچنە ئەو شوێنانە ئەگەر بوٚ حەج هاتبن، ئەوسا ئایەتی: (ليس عليكم جناح..) هات و راستییەکەی بوٚ ڕوٚشنکردنەوەو فەرمووی. ﴿[١٩٨] ليس عليكم جناح أن تبتغوا فضلا من ربكم﴾ گوناحتان ناگات ئەگەر لە ماوەی حەجدا لە پەروەردگارتان رزق و ڕوٚزی بخوازن و، بازرگانی بکەن، واتە: کە هاتن بوٚحەج هەر بە مەبەستی خواوە بێن، ئەوجا لە پاڵ ئەوەشدا ئەگەر کڕین و فروٚشتنیش بکەن بوٚ ژیان و گوزەرانتان هیچ قەیدی نییە ﴿فإذا أفضتم من عرفات﴾ جا کە ویستتان لە (عرفات) داگەڕێن و بێنە خواریٚ بوٚ "موزدەلیفە" ﴿فاذكروا الله عند المشعر الحرام﴾ هەر کە گەیشتنە (مەشعەرولحەرام) کە کێوێکە لە خوارووی موزدەلیفەوە زیکرو یادی خوا بکەن ﴿واذكروه كما هداكم﴾ وە سوپاسیشی بکەن لەبەر ئەوە کە هیچ شارەزاییتان نەبوو و خستنیە سەر ڕێی راست و مەناسکی حەجی تێگەیاندن ﴿وإن كنتم من قبله لمن الضالين﴾ خوٚ بە راستی ئێوە پێش هیدایەت و ڕێنمایی خو سەر لێشێواو و گومڕا بوون و، نەتان ئەزانی بە شێوەیەکی راست و دروست ئاداب و ئەرکەکانی حەج ئەنجام بدەن.

**چەند ڕوونکردنەوەیەك:**

١) کاتی وەستان لە ڕوٚژی (عەرەفە)دا پاش نیوەڕوٚی ڕوٚژی نوٚیەمی زیحەججەیە، هەتا کەمێك بەرلەهەڵهاتنی خوٚری ڕوٚژی دەیەمی زیحەججە، واتە ڕوٚژی جەژنی قوربان. ئەمە ڕای ئیمامی مالیك وئەبوحەنیفە وشافیعی یە "خوا لێیان خوٚش بێت" خوٚ ئەگەر پێش ئاوابوونی خوٚری ڕوٚژی عەرەفە، سنووری عەرەفەی بەجێهێشت، ئەوا جەماوەری زانایان ئەڵێن: هەر حەجەکەی دروستە، بەڵام لە باتی ئەوە دەبیٚ پەزیٚ سەربڕیٚ.

٢) لەقسەیەکی پێشەوا شافیعیدا هەیە کە: چوونە موزدەلیفە وشەو لەویٚ مانەوە واجبە، جائەگەر حاجی بوٚی نەکرا شەو لەویٚ بمێنێتەوە، دەبیٚ فیدیەو بریتی بدا.

٣) داگەڕانە خوارەوە لە عەرەفاتەوە بوٚ (مشعر الحرام)ی موزدەلیفە دوای خوٚرئاوای ڕوٚژی نوٚیەمی مانگە، واتە: شەوی جەژن.

٤) مەبەست لە حەج وعومرەدا دەبیٚ تەنها ڕەزامەندی وخوٚشنودی خوابێت، جادوای ئەونییەتە وئەنجامدانی ئەرکەکانیان، ئەگەرکەسێك کڕین وفروٚشتن ومامەڵەش بکات "بەشێوەیەکی پەسەندوجوان" ڕەوایەو گوناحی نییە.

﴿[١٩٩] ثم افیضوا من حیث أفاض الناس﴾ لە پاشان لە هەر کوێوە خەڵك داگەران بۆ (مونا) دەبێ ئێوەش هەر لەوێوە داگەڕێن واتە: ئێوە "ئەی قورەیش ودەوڵەمەندەکان" خۆتان لەو خەڵکە جیا مەکەنەوە ، با هەمووتان یەکسان بن و خۆ بە گەورە دامەنێن و، گشت پێکەوە ئاداب و پایەکانی حەج جێبەجێ بکەن ﴿واستغفروا الله﴾ لەو نافەرمانی وسەرپێچییەتان داوای لێبوردن لە خوا بکەن ﴿إن الله غفور رحیم﴾ چونکە بەڕاستی خوا لەتاوان و گوناحان زۆر لێبوردەو دڵاوایە.

**مەناسکتان بەجێ هێنا زیکری خوا زۆر بکەن:**

بەڵێ لەسەردەمی جاهیلییەتدا کە لە مەناسکی حەج دەبوونەوە، گشت کۆدەبوونەوە ودەستیان دەکرد بە هەڵدان بە باوباپیرەیاندا و باسێکی خوایان نەدەکرد، ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە و فەرموی: ﴿[٢٠٠] فإذا قضیتم مناسککم﴾ جا کە ئەرك و پایەکانی حەجتان جیبەجێکرد ﴿فاذکروا الله کذکرکم آباءکم أو اشد ذکرا﴾ هەر چۆنێ باس وخواسی باووباپیرانتان دەکەن، هەر بەو جۆرەش بگرە لەوەش پتر ناوی خوا بێنن و یادی بکەن. ﴿فمن الناس من یقول﴾ هەندێ کەس هەیە لە کاتێ دوعاو پاڕانەوەدا ئەڵێ: ﴿ربنا آتنا فی الدنیا﴾ ئەی پەروەردگاری ئێمە! لەم دونیادا هەرچیمان پێدەبەخشی، پێمان ببەخشە، ئیتر باسێکی قیامەتیان لەلانییە ﴿وما لە فی الآخرة من خلاق﴾ ئەو جۆرە کەسانە لە دواڕۆژدا هیچ بەشێکیان نابێ و، بەشبڕاو دەبن لە رەحمەتی خوا چونکە تەنها دونیا ویستبوون وداوای دونیایان کرد ﴿[٢٠١] ومنهم من یقول﴾ هەیشیانە دەڵێ: ﴿ربنا آتنا فی الدنیا حسنة وفی الآخرة حسنة﴾ پەروەردگاری ئێمە! داوات لێدەکەین هەم لە دونیادا خێروچاکەمان پێ ببەخشە، رۆزی زۆر و لەشیساغ و، زانست و زانیاری هێزی خواپەرستی، هتد.. هەم لەدواڕۆژیشدا نازو نیعمەتمان بدەرێ ﴿وقنا عذاب النار﴾ وە لەسزای ئاگریش بمانپارێزە ﴿[٢٠٢] اولئك لهم نصیب مما کسبوا﴾ دیارە ئەمانە چونکە خاوەنفام وژیرن بەپێی کردەوە کەیان بەشیاندەبێ و، بەهرەوەر دەبن ﴿والله سریع الحساب﴾ خواش زۆر بەگورج و چەسپانی حسیاب و لێپرسینەوەی هەموو شتێ دەکا، واتە: هیچ شتێکی لێتێکناچێ و، بەپەلەش حیسابی هەرکەسە ئەدا بە دەستییەوە.

**لە سێ رۆژەی دوای جەژنی قورباندا یادی خواتان لەبیر بێ:**

﴿[٢٠٣] واذکروا الله فی ایام معدودات﴾ وە لەچەند ڕۆژێکی ژمێرراو و دیاریکراوا (١٠،١١، ١٢،١٣)ی مانگی حەج لەسەر یادی خوا بەردەوامبن، واتە: هەردەم خەریکی وتنی زیکری (الله أکبر) بن ﴿فمن تعجل فی یومین﴾ ئینجا هەر کەسێك لەرەجمی شەیتانەکاندا پەلەی کرد دوو ڕۆژی پێشخست و، بۆ ڕۆژی سێیەم لەوێ نەمایەوە. ﴿فلا إثم علیه﴾ هیچ گوناهی ناگات ﴿ومن تأخر﴾ وە هەر کەسێکیش مایەوە تا ڕۆژی سێیەم بۆئەنجامدانی رەجمی شەیتانەکان ﴿فلا إثم علیه﴾ دیسانەوە هیچ گوناهی ناگات، واتە: بۆهەڵبژاردنی یەکێك لەم دووبارەیە بۆ خۆی سەربەستە گوناهێك نایەتە سەری ﴿لمن اتقی﴾ بەڵام ئەوپێش خستنەیە بۆ کەسێکە خۆپارێز بێ و، بیەوێ حەجەکەی بەرێکوپێکی بکا، واتە: لەرووی کەمتەرخەمی و گوێنەدانەوە نەبێ. ﴿واتقوا الله﴾ و لەتەواوی کاروبارتاندا لە خوا بترسن، بەتایبەت لە کاتی ئەنجامدانی مەناسکی حەجدا ﴿واعلموا انکم إلیه تحشرون﴾ وەبیشزانن کە بە ڕاستی هەموتان لای ئەو کۆئەکرێنەوەو حەشر دەکرێن.

## پەسن و رەوشتی مرۆڤی دوو ڕازیی:

(سەدی) دەڵێت: ئەخنەس"ی کوڕی شورەیقی دووڕوو" هاتەلای پەیامبەر ﷺ ئیمان وباوەڕی خۆی دەربڕیی و سوێندیشی خوارد کە: تۆم خۆش ئەوێ و، لە گەڵ ئێوەم ئیتر ئەم ئایەتە هات و فەرمووی: ﴿[٢٠٤] ومن الناس من يعجبك قوله فى الحياة الدنيا ويشهد الله على مافى قلبه﴾ مرۆڤی وا هەیە سەبارەت بە ژیانی ئەم دونیایە بە قسەو گوفتاری سەرسامت دەکاو دەربارەی ئەوەش کە لە دڵیایە خوا دەگرێ بە شایەت کە هەرچی دەڵێ ڕاستە ﴿وهو الد الخصام﴾ کەچی لە دژایەتی کردندا زۆر بێ ویژدان وسەرسەختە ﴿[٢٠٥] وإذا تولى سعى فى الأرض﴾ هەرکە پشتی لێهەڵکردی ودوورکەوتەوە دەست دەکات بە کاری بەد فەڕی لەم سەرزەوییەدا ﴿ليفسد فيها ويهلك الحرث والنسل﴾ بۆ ئەوەی خراپەی تێدا بکاو، مەزراو کشت و کێڵگەو تۆرەمە لە ناو ببا ﴿والله لا يحب الفساد﴾ هەرگیز خوا لە بەد فەڕی خۆشی نایە ﴿[٢٠٦] وإذا قيل له اتق الله اخذته العزة بالإثم﴾ هەرکە پێیشی بگوترێ: دەبێ لەخوا ترست هەبێ، ئەوسا دەمار زلی، زیاتر بەرەو تاوان وگوناح دەیبات، ﴿فحسبه جهنم ولبئس المهاد﴾ جەهەنەمی بۆ بەس دەبێت، دیارە ئەو جێیەکی زۆر خراپە! ﴿[٢٠٧] ومن الناس من يشرى نفسه إبتغاء مرضات الله﴾ لەناوخەڵکی مرۆڤی وایش هەیە لەبەر ڕەزای خوای گەورە گیانی خۆی دەبەخشێ ﴿والله رءوف بالعباد﴾ خوایش لەتەك بەندەکانی خۆیدا بەبەزەیی ودلۆڤانە .

## ئیسلامت دەبێ گشت قبووڵ بێ:

﴿[٢٠٨] ياأيهاالذين آمنوا ادخلوا فى السلم كافة﴾ ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! دەبێ هەمووتان ئامادەی چوونە ناوفەرمانی خوابن ﴿ولاتتبعوا خطوات الشيطان﴾ هەرگیزیش پێ مەنێنە جێ پێی شەیتان ﴿إنه لكم عدو مبين﴾ چونکە دیارە کەشەیتان بەئاشکرا دوژمنتانە ﴿[٢٠٩] فإن زللتم من بعد ماجاءتكم البينات﴾ ئەوسا پاش ئەوە کەئەو بەڵگە ئاشکرایانەتان بۆهات، خۆتان خلیسکان ﴿فاعلموا ان الله عزيز حكيم﴾ دەبێ چاك بزانن بەڕاستیی خوا زۆر بە تواناو بەدەسەڵاتە، دارو کار جوان و لەکارزانە ﴿[٢١٠] هل ينظرون إلا أن يأتيهم الله فى ظلل من الغمام والملائكة وقضى الأمر﴾ ئاخۆ پەیڕەوانی شەیتان بێ لەمە لەڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە لە پەڵەهەورێکی سپیدا بێتە لایان وداوەرییان بکا، فریشتەکانیش بەڕیز ئامادە بن بۆ تێپەڕانی بڕیارەکانی خوا، دادگایشیان ببڕێتەوەو، بنێردرێن بۆ دۆزەخ، دەبێ بەدەرلەمە چاوەڕوانی چی بن؟ ﴿وإلى الله ترجع الأمور﴾ ئەوساش ئەنجامی هەموو کارێ بهێنرێتەوە لای خوای گەورە و بەدادگەرانە داوەرییان بکات، ئیمامی (تەبەریی) لەفەرموودەیەکی درێژدا شێوەی هاتنی خوای گەورەی بۆدادگایی مەردم ڕۆشن دەکاتەوەو لەبەشێکی ئەو

الجزء الثاني — سورة البقرة

۞ وَاذْكُرُوا اللَّهَ فِي أَيَّامٍ مَعْدُودَاتٍ فَمَنْ تَعَجَّلَ فِي يَوْمَيْنِ فَلَا إِثْمَ عَلَيْهِ وَمَنْ تَأَخَّرَ فَلَا إِثْمَ عَلَيْهِ لِمَنِ اتَّقَىٰ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّكُمْ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٢٠٣﴾ وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يُعْجِبُكَ قَوْلُهُ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيُشْهِدُ اللَّهَ عَلَىٰ مَا فِي قَلْبِهِ وَهُوَ أَلَدُّ الْخِصَامِ ﴿٢٠٤﴾ وَإِذَا تَوَلَّىٰ سَعَىٰ فِي الْأَرْضِ لِيُفْسِدَ فِيهَا وَيُهْلِكَ الْحَرْثَ وَالنَّسْلَ وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ الْفَسَادَ ﴿٢٠٥﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُ اتَّقِ اللَّهَ أَخَذَتْهُ الْعِزَّةُ بِالْإِثْمِ فَحَسْبُهُ جَهَنَّمُ وَلَبِئْسَ الْمِهَادُ ﴿٢٠٦﴾ وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَشْرِي نَفْسَهُ ابْتِغَاءَ مَرْضَاتِ اللَّهِ وَاللَّهُ رَءُوفٌ بِالْعِبَادِ ﴿٢٠٧﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ادْخُلُوا فِي السِّلْمِ كَافَّةً وَلَا تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِينٌ ﴿٢٠٨﴾ فَإِنْ زَلَلْتُمْ مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَتْكُمُ الْبَيِّنَاتُ فَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٠٩﴾ هَلْ يَنْظُرُونَ إِلَّا أَنْ يَأْتِيَهُمُ اللَّهُ فِي ظُلَلٍ مِنَ الْغَمَامِ وَالْمَلَائِكَةُ وَقُضِيَ الْأَمْرُ وَإِلَى اللَّهِ تُرْجَعُ الْأُمُورُ ﴿٢١٠﴾

٣٢ سَلْ بَنِي

فەرموودەدا هاتووە: (.. فیشفعه الله ویأتی فی ظلل من الغمام..) واتە: خوا شەفاعەتی پێغەمبەرﷺ وەردەگرێ و، خۆیشی دێت بۆدادگایی خەڵك.

**بەنی ئیسرائیل بە چاکەی خوا نازانن!**

﴿[٢١١] سل بنی إسرائیل کم آتیناهم من آیة بینة﴾ لەبەنی ئیسرائیل" نەوەکانی یەعقووب" بپرسە! ئەرێ دەزانن کەچەندین بەڵگەو نیشانەی روونمان بۆناردوون ئەبوایە پاش ئەوبەڵگانە عیبرەتیان گرتباو سوپاسگوزاری خوایان کردبا، کەچی زۆرێکیان پشتیان لێ هەڵکردن و گۆڕیانەوە بەکوفر، دڵنیابن ﴿ومن یبدل نعمة الله﴾ هەرکەسێ نیعمەت و بەخششی خوا بگۆڕێ، واتە: لەباتی ئەوە ئەو نیشانانە بکاتە هۆی رێنموونی بۆ خۆی، کەچی لە خواپەرستی لابدات ﴿من بعد ماجاءته﴾ بەتایبەتی پاش ئەوە کەبەڵگەکانی بۆهاتن، بڕوای پێ هێنان، هەرکەسێ کاری لاساری ئاوا بکات ، لەقیامەتا تووشی سزای خۆی دەبێ ﴿فإن الله شدید العقاب﴾ بێگومانیشە سزاو تۆڵەی خوا زۆر گران وسەختە، خوای گەورە بەڵگەونیشانەیەکی زۆری دا بەجولەکەکان لەسەردەستی مووسادا‌ؑ کەچی باوەڕیان پێنەکرد و، لەباتی ئەوە پشتیان لەمووسا کرد ﴿[٢١٢] زین للذین کفروا الحیاة الدنیا﴾ ژیانی ئەم دونیایە بۆ کافران وبێ باوەڕان، جوان کراوەو رازێنراوەتەوە، بەشێوەیەك خۆیانی بۆدادەنێن ﴿ویسخرون من الذین آمنوا﴾ گاڵتەو گەپیش بەو کەسانە دەکەن باوەڕیان هێناوە، پێیان ئەڵێن سەیرکە ئەمانە ژیانی ئەم دونیایەیان چۆن لەخۆ حەرام کردووە ؟! ﴿والذین اتقوا فوقهم یوم القیامة﴾ بالێرەدا ئەو کافرانە هەرلاقرتێی خۆیان بکەن، چونکە ئەو کەسانەی کە لەدونیادا پارێزگارییان لەسنوورەکانی خوا کردووە، لەڕۆژی دواییدا لەسەرووی ئەوانەوە دەبن و ژیانی خۆشی هەتا هەتاییشیان هەیە ﴿والله یرزق من یشاء بغیر حساب﴾ خوا بۆهەرکەسێك خۆی بیەوێت رزق و رۆزی فراوانی ئەداتێ لەدونیاو لەقیامەتدا" بێ ژمارە و لێپرسینەوەو لێکۆڵینەوە.

الجزء الثاني | سورة البقرة

سَلْ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ كَمْ ءَاتَيْنَٰهُم مِّنْ ءَايَةٍۭ بَيِّنَةٍ ۗ وَمَن يُبَدِّلْ نِعْمَةَ
ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُ فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٢١١﴾ زُيِّنَ لِلَّذِينَ
كَفَرُوا۟ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا وَيَسْخَرُونَ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ۘ وَٱلَّذِينَ
ٱتَّقَوْا۟ فَوْقَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ وَٱللَّهُ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ
﴿٢١٢﴾ كَانَ ٱلنَّاسُ أُمَّةً وَٰحِدَةً فَبَعَثَ ٱللَّهُ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مُبَشِّرِينَ
وَمُنذِرِينَ وَأَنزَلَ مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ لِيَحْكُمَ بَيْنَ ٱلنَّاسِ
فِيمَا ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ ۚ وَمَا ٱخْتَلَفَ فِيهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ أُوتُوهُ مِنۢ بَعْدِ
مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ بَغْيًۢا بَيْنَهُمْ ۖ فَهَدَى ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟
لِمَا ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ مِنَ ٱلْحَقِّ بِإِذْنِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ يَهْدِى مَن يَشَآءُ إِلَىٰ
صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٢١٣﴾ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا
يَأْتِكُم مَّثَلُ ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلِكُم ۖ مَّسَّتْهُمُ ٱلْبَأْسَآءُ وَٱلضَّرَّآءُ
وَزُلْزِلُوا۟ حَتَّىٰ يَقُولَ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ مَتَىٰ نَصْرُ ٱللَّهِ ۗ
أَلَآ إِنَّ نَصْرَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ ﴿٢١٤﴾ يَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ ۖ قُلْ
مَآ أَنفَقْتُم مِّنْ خَيْرٍ فَلِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ
وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ ۗ وَمَا تَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ ﴿٢١٥﴾

٣٣

**مەردم گشت یەك بەرەبوون:**

(ئیبن جەریر) دەڵێ: نێوان (ئادەم ونوح) دە سەدەبوو، ئەو خەڵکە هەموو لەسەر هەق وراستیی بوو، پاشان هەراو ناکۆکیەکیان بوو لێکترازان و ئەوسا بۆیەکخستنەوەیان پێغەمبەر گەلێکی نارد، وەك دەفەرموێ: ﴿[٢١٣] کان الناس أمة واحدة﴾ لەسەرەتاوە هەموو خەڵك یەك دەستەو یەك بەرە بوون، گشت لەسەر ئاینێکی پاك وراست ودروست بوون، بەبێ یەکتر نەئەژیان، ئەبو هاوکاری یەکتریان بکردایە، کەچی وردە وردە لەئەنجامدا جیاوازیی وناکۆکی کەوتە نێوانیانەوەو لێکترازان ﴿فبعث الله النبیین مبشرین ومنذرین﴾ ئینجا خوا پەیامبەرانی نارد موژدە

دەربن (بە پاداشت، بۆ ئەوانەیان بڕوایان هەیە) ترسێنەریش بن (بۆ ئەوانەیان، جیاوازیی و ناکۆکی دەکەن). ﴿وانزل معهم الكتاب بالحق﴾ وە کتێب ونامەی هەق وڕاستیشی لەگەڵ ناردن" وا دەرئەکەوێ کە هەرپەیامبەرەی نامەی تایبەتی خۆی پێبووە، ئیتر قەوارەکەی زۆر بووبێت، یان کەم، نووسرابێتەوە یان نا ﴿ليحكم بين الناس فيما اختلفوا فيه﴾ تا ئەوەی بوویە کێشەی نێوانیان و، ناکۆکیی و دووبەرەکییان تێیدا هەبوو، بۆیان شی بکاتەوە، واتە: نابێ حوکمی لابەلایی بۆ خۆی بڕیار بداو هەق و ناهەق تێکەڵ بکا بەڵکو پێویستە یاسایەکی خوایی ئەو کارە بکاو، هەق وناهەق لێك بکاتەوە ﴿وما اختلف فيه إلا الذين أوتوه﴾ خۆ هەر ئەوانەیان لەو بەرنامەو کتێبەدا ناکۆکبوون، کە لەپێشدا کتێبیان پێدرابوو ﴿من بعد ما جاءتهم البينات﴾ ئەویش پاش ئەوهەموو بەڵگەو نیشانە روونانە بۆیان هاتن ﴿بغيا بينهم﴾ جیاوازیی ودژایەتیەکەشیان هەر لەبەر ئێرەیی و حەسادەتی ناوخۆیان بوو تاوایکرد پێك نەیەن، واتە: وەنەبێ ڕاستییەکانیان لێ ون بووبێت، نەخێر بەڵکو تەنها حەسادەت بوو دەستە دەستەی کردن و ڕووبەڕووی یەك وەستان وهەقیان لێگومبوو ﴿فهدى الله الذين آمنوا لما اختلفوا فيه من الحق بإذنه﴾ ئینجا ئەوانەی باوەڕیان هێنابوو، خوای گەورە بەفەرمانی خۆی شارەزاو ڕێنوێنی کردن وتێیگەیاندن کەهەق وڕاستیی لەچیدایەو قسەو بۆچوونی کێ ڕاستە ﴿والله يهدي من يشاء إلى صراط مستقيم﴾ خوا حەز لەهەرکەسێ بکات ڕێنمایی ئەکات بۆ ڕێگەی ڕاست ودروست وکێشەکەی یەکلا دەکاتەوە.

**سەرنجێك:** لەوەئەچێت هەموو ئوممەت وگەلێك پەیامبەرێکی بووبێ بە نامەیشەوە، بەڵام بەهۆی دوورکەوتنەوەی زەمان تێکەڵ وپێکەڵیان کردبێت، بۆیە لای فارسەکان وهیندییەکان هەندێ نامە وکتێب هەیە باسی ئایینیانی تێدایە.

## بە ختو خۆڕایی ناچنە بەهەشتەوە:

﴿[٢١٤] أم حسبتم ان تدخلوا الجنة﴾ ئاخۆ ئێوە بەلاتانەوە وایە کەهەر بەئاسانی دەچنە بەهەشتەوە بەرلەدیتنی تەنگانەو ناخۆشیی؟ ﴿ولما يأتكم مثل الذين خلوا من قبلكم﴾ کەچی ئەوەی بەسەر پێشینانتانا هاتووەو، تووشی گەلانی ئیمانداری پێش ئێوە بوو، هێشتا بەسەر ئێوەدا نەهاتووە ﴿مستهم البأساء والضراء وزلزلوا﴾ ئەوان تووشی گەلێ سەختیی وهەژاریی وناخۆشیی و برسیەتی و چەوسانەوە بوون، زۆر بەتوندی تەکانیان خواردوو کەوتنە چرکە چرك و لەرزە لەبەردەم نەهامەتییەکاندا ﴿حتى يقول الرسول والذين آمنوا معه متى نصرالله﴾ ئو قۆناغە سەخت ونالەبارە ئەوەندە درێژەی کێشا پەیامبەر ﷺ و ئەو بڕوادارانەش لەگەڵیا بوون دەیانگوت: دەبێ یارمەتی خوا کەی بێت و، کەی بێت بەهانامانەوە؟! بەڵێ حاڵیان ئەوەندە بەد بوو ئارامیان نەماو، داوای یارمەتییان لەخوا کردو، خوایش فەرمووی: ﴿الا إن نصرالله قريب﴾ ئاگاداربن ومزگێنی بێ کە بەڕاستیی یارمەتی خوا بۆموسڵمانان نزیکەو بەم زووانە دێ. بەڵێ یاسای خوایە کە بەبێ چەشتنی عەزیەت و ئازارو ئەشکەنجە بە تایبەت لە گۆڕەپانی جەنگدا یارمەتی نایە.

## ماڵ بە کێ دەبەخشرێت؟

﴿[٢١٥] يسألونك ماذا ينفقون﴾ لێت ئەپرسن ئەی پێغەمبەر ﷺ: چ جۆرە سامانێك ئینفاق بکەن و بە کێشی بدەن؟ دیارە ئەم خێرو بەخششە غەیری زەکاتە ﴿قل ما انفقتم من خير﴾ لە وەڵامدا پێیان بڵێ: هەرشتێکی چاك و خاوێن، بتانەوێ بیکەنە خێرو، لەڕێی خوا بیبەخشن کارێکی پەسەندە ﴿فللوالدين والأقربين واليتامى والمساكين وابن السبيل﴾ و بیدەن بەباوك ودایك و خزمی نزیکتان و هەتیوان، بێ نەوایان و، ڕێبواران (ئەوانەی لە ڕێگا داماون).

پێویستە مرۆڤ هەرگیز مافی باوك ودایك و خزمانی پشتگوێ نەخا، وەلە خێرو خێراتیشدا پێشیان بخا ﴿وما تفعلوا من خير فإن الله به عليم﴾ نەهەر ئەوە، بەڵكو هەر چاكەیەكی تر ئێوە بیكەن خوا پێی بەئاگاو زانایە وپاداشیشتان ئەداتەوە.

**جیهاد لەسەر موسڵمانان فەرزە:**

﴿[٢١٦] كتب عليكم القتال وهو كره لكم﴾ لەسەرتان جەنگ نوسراوە- لەگەڵ بێ باوەڕاندا بیكەن- دیارە جەنگیش شتێكی قورس و ناڕەحەتەو خۆشتان لێینایە، دڵ و دەروون حەزی پێ ناكا چونكە كوشتن و برین، بەخت كردنی دارایی و، بەجێ هێشتنی نیشتمانی تێدایە" بەڵام ئەگەر چی ئاوایش بێت هەر جیهاد هۆی سەرفرازیتانە" ﴿وعسى ان تكرهوا شيئا وهو خير لكم﴾ لەوانەیشە لەشتێك حەزنەكەن و ناخۆش بێت لاتان، بەڵام خێروچاكەی تێدا بێت و بەخێریش گەڕێ ﴿وعسى ان تحبوا شيئا وهو شرلكم﴾ رەنگە حەزتان لەهەندێ شت بێ و پێیشتان خۆش بێت كەچی شەڕو خراپ بێت و ئاكامەكەی باش نەبێ" مرۆڤ بە سروشت هەر دانیشتنی پێ خۆشە، بەڵام دانیشتن وخۆدزینەوە لەجیهاد ریسوایی و ژێردەستەیی بەدواوەیە ﴿والله يعلم وانتم لا تعلمون﴾ بێگومان خوا خۆی ئەزانێ چ شتێ چاكەو چ شتێ خراپە، بەڵام ئێوە نایزانن. (زوهری) ئەڵێت: جیهاد لەسەر هەمووكەسێك واجیب و پێویستە" ئیتر بەعەمەلی لە جیهادا بێت، یان دانیشتبێت ، بۆ ئەوە كەهەركاتێ داوای یارمەتی لێكرا، بۆ بەرەی جیهاد، وەیا هاواری بۆهێنرا، وە یا وترا بچۆ بۆ گۆڕەپانی جیهاد" دەبێ زوو وەڵام بداتەوە، بۆیە پەیامبەر ﷺ ئەفەرموێ: ((لاهجرة بعد الفتح، ولكن جهاد و نية، وإذا استنفرتم فانفروا)). بوخاریی: كتاب جهادوالسيرة، ص٢٧٨٣. هیجرەت لەسەرەتای ئیسلامدا فەرز بوو، چونكە موسڵمانەكان لەمەدینەدا ژمارەیان كەم بوو وپێویستییان بە قەرەباڵغی هەبوو، بەڵام كە مەككە ئازاد بوو خەڵكێكی زۆر چوونە ناو ئیسلامەوە، هیجرەتیش "بۆ مەدینە" نەما، بەڵام نیشتمان چۆڵكردن لەبەر جیهاد، تارۆژی قیامەت بەردەوامە، یان بەدڵ لێبران بۆ دووركەوتنەوە لەكاری خراپ و، ئەنجامدانی كاری چاكە هەر بەردەوامە.

الجزء الثاني — سورة البقرة

كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ وَعَسَىٰ أَن تَكْرَهُوا
شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَعَسَىٰ أَن تُحِبُّوا شَيْئًا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ
وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٢١٦﴾ يَسْأَلُونَكَ عَنِ الشَّهْرِ
الْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ اللَّهِ
وَكُفْرٌ بِهِ وَالْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَإِخْرَاجُ أَهْلِهِ مِنْهُ أَكْبَرُ
عِندَ اللَّهِ وَالْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ الْقَتْلِ وَلَا يَزَالُونَ يُقَاتِلُونَكُمْ
حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمْ عَن دِينِكُمْ إِنِ اسْتَطَاعُوا وَمَن يَرْتَدِدْ
مِنكُمْ عَن دِينِهِ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُولَٰئِكَ حَبِطَتْ
أَعْمَالُهُمْ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَأُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ
هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴿٢١٧﴾ إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَالَّذِينَ
هَاجَرُوا وَجَاهَدُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أُولَٰئِكَ يَرْجُونَ رَحْمَتَ
اللَّهِ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢١٨﴾ ۞ يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ
وَالْمَيْسِرِ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَا
أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا وَيَسْأَلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ الْعَفْوَ
كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمُ الْآيَاتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١٩﴾

الحزب ٤

٣٤ — فِي الدُّنْيَا

**بەشەڕهاتن لە (أشهر الحرم)دا:**

﴿[٢١٧] يسألونك عن الشهر الحرام قتال فيه﴾ لێت ئەپرسن لەبارەی جەنگ كردن لەمانگی حەرامدا: ئاخۆ ڕەوایەو مۆڵەت هەیە، یانا؟ پەیامبەر ﷺ (عەبدوڵڵای كوڕی جەحشی) پوورزای خۆی لە مانگی جەمادی دووەمدا پێش ڕووداوی بەدر بە دوومانگ لەگەڵ هەشت كەسی كۆچەرییدا نارد، ئەوەبوو لە ڕێگادا ئەوقەی سێ كەسی قوڕەیش بوون و، یەكێكیان لێ كوژراو، دوانیان لێ دیل كران و هێنانیان بۆ خزمەت پەیامبەر ﷺ، ئەویش ئەو كارەی

پێناخۆش بوو، چونکە ڕێکەوتی بەرواری یەکی " ڕەجەب" ی دەکرد واتە:مانگە قەدەغە کراوەکان، جا قورەیش لێیان کردە هەرا کە موحەممەد ﷺ لە مانگە حەرامەکاندا جەنگی حەڵاڵ کردووە خوای گەورەش فەرمووی: ﴿قل قتال فیه کبیر﴾ لە وەڵامدا بڵێ: بەڵێ جەنگ کردن لەم جۆرە مانگانەدا کارێکی زۆر گەورەو ئوناهە ﴿وصد عن سبیل الله وکفر به﴾ بەڵام ڕێگرتن لە ڕێگەی خواو بێ بڕوایی بەخواو ﴿والمسجد الحرام و إخراج أهله منه اکبر عندالله﴾ جەنگ کردن لەمزگەوتی حەرام داو دەرکردن و دەربەدەرکردنی خەڵکەکەی، ئەمانە گشت لەلای خوا زۆر گەورەوگران ترن لەجەنگی مانگە حەرام کراوەکان، کەوابوو ئەو کارە کەلەدەستی عبدوڵلاوە کەوتەوە لەو ڕێگرتنە لەدینی خواو، کافر بوون بەخواو، ئەشکەنجەو ئازاردانی موسڵمانان لەلایەن قورەیشەوە ئەو کارەی عەبدوڵلایش لەوەی قوریش گەورەتر نییە ﴿والفتنة اکبر من القتل﴾ وە ئاژاوە و فیتنە نانەوەش لە کوشتن و جەنگ کردن و زۆرهێنان بۆ موسڵمانان تاپاشگەز ببنەوە لەجەنگ لەمانگی حەرامدا خراپترو گەورەترە ﴿ولا یزالون یقاتلونکم حتی یردوکم عن دینکم إن استطاعوا﴾ بێگومانبن هەمیشە ئەو بێ باوەڕانە جەنگتان لەگەڵ دەکەن و هەرگیز کۆتایی ناهێنن و دەست هەڵناگرن " تائەگەر بۆیان بگونجێ" لە ئایینتان وەردەگێڕن ﴿ومن یرتدد منکم عن دینه﴾ جا هەرکەسێکتان لەئایینی خۆی پاشگەز بێتەوە ﴿فیمت وهو کافر﴾ و بەکافرییش بمرێ ﴿فأولئك حبطت أعمالهم فی الدنیا والآخرة﴾ ئەوانە کە بەکافری دەمرن کارو کردەوەیان لە هەردوو دونیا بەفیڕۆ دەڕوا، لەم دنیایەدا لە خێرو بێری ئیسلام بێ بەش ئەبن و، مامەڵەی بێ بڕواییان لەگەڵ دەکرێ، لەولایش هیچ پاداشتێکی خێریان نابێت ﴿وأولئك أصحاب النار هم فیها خالدون﴾ دەشبنە هاوەڵ و هاوڕێی دۆزەخ و، بەهەتاهەتایش لەوێ ئەمێننەوە.

<u>ڕوونکردنەوەیەك</u>: ئیمامی (مالیك) و ئیمامی (ئەبی حەنیفە) دەڵێن: هەرکەسێ بە کافریی، وەیا بە (مورتەدی) مرد، هەرچی کاروکردەوەی چاکیشی هەبێ بەفیڕۆ ئەڕواو باتڵ دەبێ، وە هەروەها ئیمامی(شافیعی) و بگرە کۆی زانایانیش دەڵێن: تەنانەت ئەگەر تەوبەش بکا پاش لە دین وەرگەڕانەکەیی و موسوڵمان بێتەوە دەبێ هەموو کارەچاکەکانی بکاتەوەو قەزایان بکاتەوە ، بۆ نموونە: ئەگەر حەجی کردبێ، دەبێ ئێستا دووبارە بیکاتەوە، بەڵام ئیمامی (شافیعی) بەتەنها خۆی ئەڵێ: گێڕانەوەو کردنەوەیان ناوێ. لە نێو زاناکانا کێشەیەك هەیە: ئایا مرۆیەکی لە دین وەرگەڕاوەو (مورتەد) دەس بەجێ دەکوژرێ، یا مۆڵەت دەدرێ، ئەگەر موسڵمان نەبوویەوە ئەوسا ئەکوژرێ؟؟ جەماوەری زانایان ئەڵێن: داوای تەوبەی لێ ئەکرێ، جائەگەر هەر سوور بوو لەسەر کوفرەکەی ئەوا ئەکوژرێ، بەڵام پێشەوا (مالیك) ئەڵێ: ئەگەر کەسێ جوێنی بە پێغەمبەردا، ئەوە دەس بەجێ بێ ئەوەی داوای تەوبەی لێبکرێ ئەکوژرێ. دیارە هەموو خاوەن ڕایەکانیش بەڵگەی خۆیانیان هەیە. ﴿[218] إن الذین آمنوا والذین هاجروا﴾ بێگومان ئەو کەسانەی کە بڕوایان هێناوکۆچیان کردوو و دەربەدەر بوون ﴿وجاهدوا فی سبیل الله﴾ و لەڕێی خوادا جیهادیان کرد ﴿أولئك یرجون رحمة الله﴾ ئەو بەڕێزانە بەتەمای ڕەحمەت و بەزەیی و میهرەبانی خواوەندن" بۆیە ئەوەندە خۆیان ماندووئەکەن ودەکۆشن" ﴿والله غفور رحیم﴾ بێگومانیش خوا پۆشەرو دلۆڤانە. کارەکەی عەبدوڵلایش چونکە تێوە تلان وناچاریی بووە، ئەگەر هەڵەیەکیشی تیابووبێت، خوای گەورە چاوپۆشیان لێ ئەکات.

**شەراب خواردنەوەو قومار کردن:**

پێشەوا (ئەحمەد) دەڵێت: پەیامبەر ﷺ کاتێ ڕۆیشتە مەدینە، خەڵکێکی زۆر عەرەق خۆرو قومارچی بوون بۆیە هاتن پرسیاری حوکمی ئەم دوانەیان لە پێغەمبەر ﷺ کرد، جا بۆ ئەو وەڵامە ئایەتی: (یسألونك عن الخمر..)ی هات، بەڵام لەبەرئەوە کەباسی زیان و قازانجی عەرەق وقوماریشی دەکرد، هێشتا ئەو خەڵکە بەتەواوی قەناعەتیان نەکرد

کە شەراب خواردنەوەو قومار یاساغ بن، تا جارێك پیاوێکی کۆچەریی سەرخۆش، پێش نوێژی ئەکرد و قورئانەکەی تێکەڵ کرد، ئینجا بەتوندتر لەوە، ئەم ئایەتەش هاتە خوارەوە: (یاأیهاالذین امنوا لا تقربوا الصلاة وأنتم سکاری..) لەپاشان سەخت تر لەمیش ئایەتی: (یاأیها الذین أمنوا إنما الخمر والمیسر والأنصاب والأزلام..) هات" ئەوسا ئیتر بەتەواوی دەستیان لەشەراب خواردنەوەو قومارکردن هەڵگرت ﴿[٢١٩] یسألونك عن الخمر والمیسر﴾ لە بابەت بادەو شەراب و قومارەوە لێت دەپرسن: ئاخۆ ئەوانە حەڵاڵ و ڕەوان، یان حەرامو ناڕەوان؟ ﴿قل فیهما إثم کبیر ومنافع للناس﴾ پێیان بڵێ: تاوان و گوناهیان گەورەیە، چونکە وتەی ناشیرین و، جمووجوڵی ناپەسەندو، خواردنی سامانی ئەم وئەویان بەناهەق تێدایە، بۆ خەڵکیش بڕێ قازانج و کەڵکیان بۆ هەیە" خۆشیی و لەزەتێکی تێدایە بۆیان" باری ئابووریی وبازرگانیش بۆ هەندێ کەس دەسدەدا ﴿وإثمهما اکبر من نفعهما﴾ بەڵام تاوان و زیانەکانیان لە سوودوو بەهرەکەیان زۆر ترە ﴿و یسألونك ماذا ینفقون﴾ لێشت ئەپرسن چی ئینفاق بکەن لە ڕێگەی خوادا..؟ ﴿قل العفو﴾ بڵێ ئەی پەیامبەر ﷺ زێدە لەخۆتان و، لەماڵ و منداڵتان، ببەخشن ﴿کذلك یبین الله لکم الآیات﴾ هەر ئابەو شێوەیە خوای گەورە بەڵگەو نیشانەکانی خۆیتان بۆ ڕوون دەکاتەوە، هەر شتێك قازانج و سوود بەخش بێت بۆتان ڕەوا ئەکا، هەرشتێکیش زیان بەخش بێت لێتان یاساغ ئەکات" ﴿لعلکم تتفکرون * [٢٢٠] فی الدنیا والآخرة﴾ بەڵکو بتوانن لە ئاکامی کاروباری دونیاو قیامەتتان بیر بکەنەوە" هیچ کامێکیان پشت گوێ نەخەن" لەم ئایەتەوە: هەموو جۆرە شەراب و قومارێك ئەگەرچی ناوی جۆراوجۆری تریشیان لێ نرابێ قەدەغەن. باشترین و پیرۆزترینی سەدەقە ئەوەیە: کە لە کاتی دەوڵەمەندیی و دەسەڵات و زیاد لە پێویستی یەکانی خاوو خێزان بێت. ((إبدأ بنفسك فتصدق علیها، فإن فضل شئ فلأهلك فإن فضل شئ عن أهلك فلذی قرابتك ، فإن فضل عن ذي قربتك شئ فهکذا" أي: تصدق به علی الفقراء و المساکین)) موسلیم ریوایەتی کردووە. واتە: لەبەرا چاوت لەخۆتەوە بێت، ئەوجا منداڵ وخێزانت، پاشان خزمانی نزیکت، دواتر خەڵکانی تر.



فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ ۗ وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْيَتَامَىٰ ۖ قُلْ إِصْلَاحٌ لَّهُمْ
خَيْرٌ ۖ وَإِن تُخَالِطُوهُمْ فَإِخْوَانُكُمْ ۚ وَاللَّهُ يَعْلَمُ الْمُفْسِدَ مِنَ
الْمُصْلِحِ ۚ وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لَأَعْنَتَكُمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٢٠﴾
وَلَا تَنكِحُوا الْمُشْرِكَاتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ ۚ وَلَأَمَةٌ مُّؤْمِنَةٌ خَيْرٌ
مِّن مُّشْرِكَةٍ وَلَوْ أَعْجَبَتْكُمْ ۗ وَلَا تُنكِحُوا الْمُشْرِكِينَ حَتَّىٰ
يُؤْمِنُوا ۚ وَلَعَبْدٌ مُّؤْمِنٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكٍ وَلَوْ أَعْجَبَكُمْ ۗ أُولَٰئِكَ
يَدْعُونَ إِلَى النَّارِ ۖ وَاللَّهُ يَدْعُو إِلَى الْجَنَّةِ وَالْمَغْفِرَةِ بِإِذْنِهِ ۖ
وَيُبَيِّنُ آيَاتِهِ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٢١﴾ وَيَسْأَلُونَكَ
عَنِ الْمَحِيضِ ۖ قُلْ هُوَ أَذًى فَاعْتَزِلُوا النِّسَاءَ فِي الْمَحِيضِ ۖ
وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ ۖ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ
أَمَرَكُمُ اللَّهُ ۚ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ ﴿٢٢٢﴾
نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ ۖ وَقَدِّمُوا لِأَنفُسِكُمْ ۚ
وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّكُم مُّلَاقُوهُ ۗ وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ
﴿٢٢٣﴾ وَلَا تَجْعَلُوا اللَّهَ عُرْضَةً لِّأَيْمَانِكُمْ أَن تَبَرُّوا
وَتَتَّقُوا وَتُصْلِحُوا بَيْنَ النَّاسِ ۗ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٢٤﴾



## لە مەڕ هەتیوان چۆن ڕەفتار بکەین؟

﴿ویسألونك عن الیتامی﴾ لەتۆ پرسیار ئەکەن ئەی پەیامبەر ﷺ سەبارەت بەهەتیوان، چۆن ڕەفتاربکەین؟ ئاخۆ ئاوو خۆراکیان جیا بێت لێمان یان نا؟ ﴿قل إصلاح لهم خیر﴾ بڵێ: هەردەم بەچاکەو چاکەکاری ئاگاتان لێیان بێت وبتوانن بەجیا ماڵەکەیان ڕاگرن، کارێکی چاکە بۆیان ﴿وإن تخالطوهم فإخوانکم﴾ خۆئەگەر لەگەڵ ئێوە دەژین و ماڵ وسامانی ئەوانتان لەگەڵ ماڵ وسامانی خۆتان لێکداو وەك براو خوشکی خۆتان بن، ئەوە کارێکی زۆرباشە ﴿والله یعلم المفسد من المصلح﴾ خۆ خوا کەسانی فەسادکارو بەدکار لەکەسانی چاککار زۆر چاك دەناسێت ﴿ولو شاء الله

لأعنتكم﴾ ئەگەر خوا بیویستبا، فەرمانی جیاکردنەوەی ماڵی هەتیوانی ئەداو مەرجی سەختی لەسەر دائەنان ﴿إن الله عزيز حكيم﴾ چونکە بەراستیی خوا هەرخۆی زاڵ و باڵادەستە، حەکیم وکارجوان و لە کارزانە، بۆ ئەوکەسەی وا چاودێرو سەرپەرستی کاری هەتیوە، بەڵێ تێکەڵکردنی دارایی وسامانی هەتیو بەماڵی سەرپەرستی هەتیوەکەوە "لەگەڵ پێش چاوگرتنی بەرژەوەندی هەتیوەکەدا" بەمەرجێ خێرو سوودی ئەوە، زیاتر بێ بۆ هەتیوەکە کارێکی رەوایە، خۆ ئەگەر بەو تێکەڵکردنە ماڵی هەتیوەکە کەم ونوقوستان دەبوو، دیارە ئەوە حەرامو قەدغەیە.

**لە بت پەرستان ژن مارە ناکرێ و، ژنیشیان لێ ناخوازرێ:**

﴿[٢٢١] ولا تنكحوا المشركات حتى يؤمن﴾ ژنانی خوانەناس وهاوبەشدانەر مارە مەکەن، تا باوەری دامەزراوو راستەقینە دێنن، ئیمامی (تەبەری) دەڵێت: ژنانی خاوەن کتێب ونامە ، بەر (نەهیی) ئەم ئایەتە ناکەون، واتە: ژنانی ئەهلی کتێب دەتوانرێ مارە بکرێن چونکە ئەمان بەئایەتی: (والمحصنات من الذين أوتوا الكتاب من قبلكم ..) لەسوورەتی (النساء) مارە کردنیان بۆ موسوڵمانان حەڵاڵ کراوە. پێشەوا (عومەر)یش ئەوکاتە کەرێی لە (تەڵحەو حوزەیفە) گرت لە مارەکردنی ژنانی جوولەکەو گاور لەبەرئەوەبوو کەخەڵکێکی تر چاولەوان نەکاو، دەرەنجام دەست لەژنە موسڵمانەکان هەڵبگیردرێ ﴿ولأمة مؤمنة خير من مشركة ولو أعجبتكم﴾ وە بەراستیی کەنیزەیەکی بروادار بۆ هاوجووت لە ژنێکی هاوبەش دانەر هێژاترو باشترە، ئەگەرچی ئەم ژنە خوانەناسە جوانیی وماڵ ودارایی یەکەی سەرسامی کردبن و زۆریش حەزیان لێبکەن ﴿ولا تنكحوا المشركين حتى يؤمنوا﴾ ژنان و کچانی باوەڕدار لەخوانەناس و هاوبەش دانەران مارە مەکەن تا نەبنە خاوەن باوەڕی دامەزراو ﴿ولعبد مؤمن خير من مشرك ولو أعجبكم﴾ چونکە بێگومانە کەبەندەیەکی باوەردار لەپیاوێکی ئازادی هاوبەش دانەرو خوانەناس هێژاتروچاکترە، هەرچەن ئەو موشریکە قەدوقیافەو پایەوپلەی سەراسیمەتان بکات ﴿أولئك يدعون إلى النار﴾ چونکە بەڕاستیی ئەو هاوبەش دانەرانە خەڵکی بۆ نێو ئاگر بانگ دەکەن ﴿والله يدعوا إلى الجنة والمغفرة بإذنه﴾ خوایش بەفەرمانی خۆی بەرەو بەهەشت و لێبوردن بانگ دەکات ﴿ويبين آياته للناس لعلهم يتذكرون﴾ خوا بەڵگەونیشانەکانی خۆیی وحوکمی خۆی هەمیشە بۆخەڵك روون ئەکاتەوە، بەڵکو بیر بکەنەوەو ئامۆژگاری وەرگرن. جائەوابوو خواستن و مارەکردنی ژنانی موشریك و کافرو (مورتەددە)و لەدین وەرگەڕاوە باتڵ و قەدەغەیە، بەڵام ژنانی ئەهلی کیتاب" بێجگە لە موحاریب" خواستن و مارەکردنیان حەڵاڵە" وەبە هیچ جۆرێکیش ژنی موسڵمان و خاوەن باوەر نابێ لەموشریك وکافرو لەدین وەرگەڕاوەو ئەهلی کیتاب مارەبکرێ" دەبێ هەوڵ بدرێ کە بەهیچ شێوەیە لەگەڵ دام و دەزگای کافران لێك نزیك نەبینەوەو، دەبێ لەسەر رێژەی بنەمای (مووالات) و (موعادات) مامەڵەیان لەگەڵ بکرێ.

**لە عوزری ژنانتاندا سەرجێیی مەکەن:**

لەسەردەمی نەفامیدا "بەتایبەت جوولەکە" هەرئافرەتێك دەکەوتە بێ نوێژییەوە لەتەکیا دانەدەنیشتن و، نانیان لەگەڵ نەدەخواردن، لە پاشان خوا ئەم ئایەتەی خوارەوەی ناردو تێیگەیاندن کە تەنها کاری ژن ومێردی لەگەڵیا حەرامە، ئەگینا پێکەوە نانخواردن وپێکەوەخەوتن و..هتد حەڵاڵە.موسلیم. ﴿[٢٢٢] ويسألونك عن المحيض﴾ ئەی پێغەمبەر ﷺ سەبارەت بە تێکەڵی ژنان لەسەردەمی بێ نوێژیی وحەیزیاندا لێت دەپرسن؟ ﴿قل هو أذى﴾ پێیان بڵێ: ئەو خوێنە شتێکی زیانـاویی و قیزەونەو هەرکەسێك لێی نزیك ببێتەوە تووشی عەزیەت وئازار دەبێ ﴿فاعتزلوا النساء في المحيض﴾ جا کەوابوو ئێوەیش لەماوەی بێ نوێژییاندا لێیان وەدووربن وتێکەڵی سەرجێیان مەکەن ﴿ولا تقربوهن حتى يطهرن﴾ وە نابێ نزیکیان ببنەوەو بچنەلایان، هەتاپاك دەبنەوە ﴿فإذا تطهرن فأتوهن﴾

جاكە پاكیش بوونەوەو خۆشیان شوشت، ئەوجا دەتوانن بۆیان بچن و تێكەڵاوییان لەگەڵ بكەن ﴿من حيث أمركم الله﴾ لەو جێیەوە خوا ڕێی پێداون، واتە: لە پێشەوە ﴿إن الله يحب التوابين ويحب المتطهرين﴾ بەراستیی خوا ئەو كەسانەی خۆش دەوێ كە لە گوناه پەشیمان دەبنەوەو، خۆیان بەپاك وخاوێن رادەگرن" تەبیعەت پاكن لەكاتی حەیزدا، لەپاشەوەی قەدەغەكراو ناچنە لای ژنەكانیان" ﴿[٢٢٣] نساؤكم حرث لكم﴾ ژنەكانتان لەكاتی پاكییدا جێی كشتوكاڵتانن جێگەی سەوز بوونی تۆوتانن ﴿فأتوا حرثكم انى شئتم﴾ كەوابوو لەهەر كوێوە دەتانەوێ بچنە كێڵگەكەتانەوە بەهەركات وبەهەرجۆر ئەتانەوێ "هەر لەجێگەی سەوزكردنەوە بێ و، پاك بێ ﴿وقدموا لأنفسكم﴾ هەر شتێك كە هۆی قازانجە بۆتان" هەموو كردەوەیەكی خێر، دیارە ئەوە منداڵیش دەگرێتەوە، پێشی خۆتانی بخەن ﴿واتقوا الله﴾ دەبێ لە بڕیارەكانی خواش پارێز بكەن و سنووری مەشكێنن ﴿واعلموا انكم ملاقوه﴾ چاكیش بیزانن كە بێگومان ئەچنە پێشگای خواو، بەدیداری شاد ئەبن و لێشتان ئەپرسێتەوە: چیتان كرد، چۆنتان كرد؟ ﴿وبشر المؤمنين﴾ بڕوادارنیش دڵخۆش بكە بەو دیدارەو بە هەموو نازو نیعمەتەكانی بەهەشت كە بۆیان ئامادەكراوە. لەم دوو ئایەتەدا (٢٢٢-٢٢٣) وەردەگیردرێ كە: دەست تێكەڵ كردن لەگەڵ ژنەكانتاندا لەكاتی بێ نوێژی و زەیسانیدا قەدەغەو حەرامە، ژنی بێ نوێژو زەیسان تا خوێنەكەی تەواو نەبێ و نەوەستێتەوەو خۆی نەشۆرێ حەرامە چوونە لای، چوونە لای ژنان لە پاش (دبر) یەوە " بەدەنگی كۆی زاناكان"حەرامە. خۆ پاك كردنەوە لە گوناح و تاوان بەتەوبە، وە لە هەموو چڵك و چەپەڵی یەك واجبێكی ئیسلامی یە، رای جەماوەری زانایان لەسەر ئەوەیە هەر كەسێ لە كاتی حەیزدا چوویە لای ژنەكەی كەفارەتی لەسەر نییە، بەڵكو دەبێ تەوبە بكا، ئەو فەرموودەیەش كەدەڵێ: (الكفارة بنصف دينار أو دينار) بە لاوازیان داناوە.

الجزء الثاني | سورة البقرة

لَّا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغۡوِ فِيٓ أَيۡمَٰنِكُمۡ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا كَسَبَتۡ
قُلُوبُكُمۡۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٞ ﴿٢٢٥﴾ لِّلَّذِينَ يُؤۡلُونَ مِن نِّسَآئِهِمۡ تَرَبُّصُ
أَرۡبَعَةِ أَشۡهُرٖۖ فَإِن فَآءُو فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٢٢٦﴾ وَإِنۡ عَزَمُواْ
ٱلطَّلَٰقَ فَإِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ﴿٢٢٧﴾ وَٱلۡمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصۡنَ
بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٖۚ وَلَا يَحِلُّ لَهُنَّ أَن يَكۡتُمۡنَ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ فِيٓ
أَرۡحَامِهِنَّ إِن كُنَّ يُؤۡمِنَّ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ
فِي ذَٰلِكَ إِنۡ أَرَادُوٓاْ إِصۡلَٰحٗاۚ وَلَهُنَّ مِثۡلُ ٱلَّذِي عَلَيۡهِنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ
وَلِلرِّجَالِ عَلَيۡهِنَّ دَرَجَةٞۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٢٨﴾ ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ
فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٖۗ وَلَا يَحِلُّ لَكُمۡ أَن
تَأۡخُذُواْ مِمَّآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ شَيۡـًٔا إِلَّآ أَن يَخَافَآ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ
ٱللَّهِۖ فَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَا فِيمَا ٱفۡتَدَتۡ
بِهِۦۗ تِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَعۡتَدُوهَاۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ
هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٢٩﴾ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُۥ مِنۢ بَعۡدُ حَتَّىٰ تَنكِحَ
زَوۡجًا غَيۡرَهُۥۗ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَآ أَن يَتَرَاجَعَآ إِن ظَنَّآ أَن
يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِۗ وَتِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِ يُبَيِّنُهَا لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ﴿٢٣٠﴾

وَإِذَا طَلَّقۡتُمُ | ٣٦

**بۆ واز هێنان لەكاری چاكە سوێند بەخوا ناخورێت:**

﴿[٢٢٤] ولا تجعلوا الله عرضة لأيمانكم أن تبروا وتتقوا وتصلحوا بين الناس﴾ وە سوێندەكانتان بەخوا مەكەنە كۆسپ و بەرهەڵست بۆ كردنی چاكەو ڕێخستنی نێوانتان و خۆپارێزیی و تەقواتان" واتە: ئەگەر سوێندتان خوارد بۆ نەكردنی هەر كارێكی چاك" با ئەو سوێندە نەبێتە لەمپەرو مانیع بۆ نەكردنی ئەوكارە خێرە، بەڵكو سوێندەكەتان بشكێنن و كەفارەتی بدەن وبچن ئەوكارە چاكانە ئەنجام بدەن ﴿والله سميع عليم﴾ خوا زۆر بیسەرو زانایە ئاگاداری هەموو نیازو نیەتێكتانە ﴿[٢٢٥] لا يؤاخذكم الله باللغو في ايمانكم﴾ بێگومان خوای گەورە بەو سوێندە بێ نیازو سەر زارەكیانە پرسیارتان لێ ناكاو لێتان ناگرێ واتە: ئەو سوێندانەی كە" لە خۆتانەوە بێ ئیرادەو نیاز! "ناوەڵڵاو بەڵێ وەڵڵا " لەدەمتان دەردەچن، گوناهتان ناگات گەر كاریان پێنەكەن ﴿ولكن يؤاخذكم بما

کسبت قلوبکم﴾ بەڵکو لەسەر ئەوسوێندانە لێیتان دەگرێ کە نیەتی دڵتانی لەسەرەو ئاگاتان لەخۆتانە" واتە: هەر سوێندێ بەنیازو نیەت بوو و شکانتان، دەبێ تۆڵەو کەفارەتی بدەن، بەوپێیە کە لەسوورەتی (مائیدە)دا روونکراوەتەوە ﴿والله غفور حلیم﴾ و خوا زۆر پۆشەرو بەتاقەت ولەسەرخۆیە.

**سوێند دەخۆن لەگەڵ ژنەکانیان نەنوون:**

﴿[٢٢٦] للذین یؤلون من نسائهم تربص اربعة أشهر﴾ ئەو کەسانەی سوێند دەخۆن لەگەڵ ژنەکانیان "دەس تێکەڵ نەکەن ونەخەون" هەتا چوار مانگ مۆڵەتیان دەدرێ بۆشکاندنی سوێندەکانیان و گەرانەوە بۆسەر جێگەی خەوتنیان ﴿فإن فاؤا فإن الله غفور رحیم﴾ ئینجا ئەگەر لەو ماوەیەدا گەرانەوە لایان و سوێندەکانیان شکاندو رێککەوتن و چوونەوە لای ژنەکانیان، ئەوە بێگومان خوا زۆر لێبوردەو چاوپۆشیکارو داوۆڤانە، دەبورێ لەوماوەیە. ﴿وإن عزموا الطلاق فإن الله سمیع علیم﴾ خۆئەگەر "پاش ئەو چوارمانگە" بۆ تەلاق دانیان هەرسوور بوون و لێ بران و نەگەرانەوە لایان، ئەوە بەراستیی خوا بیسەرو زانایە.

**بەکورتیی:** کەسێ سوێندی خوارد نەرواتە لای ژنەکەی، ئەوە نابێ ئەوسوێندە لەچوارمانگ زیاتر تێپەرێ، خۆ ئەگەر پێش چوار مانگەکە گەرایەوەو چوویەوەلای ژنەکەی" دیارە ئەوە هیچی لەسەر نییە، تەنانەتی ئیبن عەباس "خوای لێ رازیی بێت "ئەڵێت: ئەگەر چوار مانگەکە تێپەریی و، ئەوکەسە هەر سوور بوو لەسەر قسەی خۆی ئەوە خۆبەخۆ یەك تەلاقی ئەکەوێ ژنەکە (بائن)ە دەبێتەوەو رزگاری دەبێ لێی، ئەمە راوبۆچوونی ئەبو حەنیفەیشە "خوا لێیان خۆش بێت" خۆئەگەر هەر درێژەی دایەو نەگەرایەوە لای، ئەوا پاش چوارمانگ داوەری شەرعی بەزۆر پێی تەلاق دەدا، چونکە دینی ئیسلام، هەرچۆنێ نان ونەفەقەی داناوە، سەر جێگایشی داناوە، بۆیە ئەگەر لەو چوارمانگەدا نەگەرایەوە سەر جێگاکەی، دادوەر لێکیان جیا دەکاتەوە، پیاوەکە پێی خۆش بێت، یان نا! تەنانەتی (ئیبن تەیمییە) دەڵێ: ئەگەر پیاوەکە تاقەی سەرجێگای نەبوو، دادگا پێی تەلاق دەدات.

**عیددەی ژنی تەلاقدراو:**

﴿[٢٢٨] والمطلقات یتربصن بأنفسهن ثلاثة قروء﴾ ئەو ژنانەی –پاش چوونە لایان– تەلاق دران، تا سێ پاکیی دەبێ خۆیان بگرن ومێرد نەکەنەوە. (قورء) لەسەر قسەی ئیمامی شافیعی و ئیمامی مالیك پاکیە، یان دەڵێن: تا سێ حەیز دەبینن ئەگەر خاوەن حەیز بوون لەسەر وتەی (ئەبو حەنیفە) و ئیمامی (ئەحمەد) دەبێ دانیشن، لەپاشان ئارەزووی خۆیانە شوو بکەنەوە، یان نا ﴿ولا یحل لهن أن یکتمن ما خلق الله فی أرحامهن﴾ بۆ ئەو ژنە تەلاقدراوانە رەوا نییە ئەوەی خوا خستوویەتە منداڵدانیانەوە بیشارنەوە، واتە: ئەگەر سکیان پربوو، وەیان لەحەیزدا بوون، نابێ کیتمانی بکەن، بەڵکو دەبێ هەر راستییەکەی بڵێن ﴿إن کن یؤمن بالله والیوم الآخر﴾ ئەگەر باوەریان بەخواو بەرۆژی دوایی هەیە دەبێ کیتمانی هەق نەکەن ﴿وبعولتهن احق بردهن فی ذلك﴾ مێردەکانیان "لە پیاوانی تر" خاوەن هەق ترن بۆدیسان گەرانەوە لایان، لەماوەی عیدەدا، تا ئەوە کە شوو بە یەکێکی تربکەن ﴿إن أرادوا إصلاحا﴾ ئەگەر لەو ماوەیەدا بیانەوێ "ئاشتیی بکەن و" کاروباری خۆیان رێك وپێك بکەن، دیارە هەقی گەرانەوە، بۆ تەلاقێکە، کە مافی گەرانەوەی تێدا هەبێ ﴿ولهن مثل الذی علیهن بالمعروف﴾ ژنان هەرچۆنێ ئەرکی ژنانەیان لەسەرە، مافی رەوای خۆشیان لەسەر پیاوان بەشێوەیەکی پەسەندی کۆمەڵگەی ئیسلامیی هەیە، واتە: دەبێ هەردوولا مافەکانی یەکتر بپارێزن و، کەسێکیان ستەم لەویتریان نەکات، ئەگەر پیاوان لەسەریان بێت مارەییان بدەن و، ژیان و ژیواری باشیان بۆ پەیداکەن و، قەتیش ئەزیەت وئازاریان نەدەن، هەروایش دەبێ ژنان ریعایەتی حاڵ و

ژیانی مێردەکانیان بکەن و، ڕووخۆش و، ڕوو گەشبن لەتەکیانداو، زیادەڕەوو(موسریف) نەبن لەهیچ کارێکیاندا ﴿وللرجال علیهن درجة﴾ زیاد لەمەیش پیاوان پلەیەکیان بەسەر ژنانەوە هەیە. (سەید قوتب) ئەڵێ: ئەو پلە زیادەیە کە بۆ پیاوان هەیە ئەوەیە کە دەتوانێ دوای تەڵاقدان ژنەکە بگێڕێتەوە ژێر ڕکێفی خۆی، بەڵام ئافرەتەکە ناتوانێ ئەو کارە بکات، ئەگەرچی هەندێ لەزانایان دەڵێن ئەوپلەیە هەرئەو(قەووامە)یە کەلە سوورەتی (نیساء)دا باسکراوە، خۆئەگەر" گریمان" ئەمەیش بێت، دیارە کە ئەوپلەیە پلەی (تەکلیف)ـە نەك (تەشریف)، لەئایەتی (٥٩)ی (نەحل)یشدا هەرلەم بابەتە شتێك نووسراوە، ﴿والله عزیز حکیم﴾ وەخواش دەسەڵاتدارو زاڵە، لەکارزان و کار بەجێیە. چونکە مافی بە ژنان بەخشیی، پاش ئەوەی کە وەك کوتاڵ و کەل و پەل سەیر ئەکران!!

**تەڵاق سیانەو، ژن دوو کەڕەت دەهێنرێتەوە:**

﴿[٢٢٩] الطلاق مرتان﴾ ئەو تەڵاقە کەمێرد بتوانێ تێیدا ژنەکەی بگێڕێتەوە بۆلای خۆی تەنها دووکەڕەتە ﴿فإمساك بمعروف أو تسریح بإحسان﴾ ئینجا دوایی (بۆ سێیەم جار) یائەبێ بەیاسایەکی چاك وقەشەنگ و، بە گوزەرانێکی پەسەند ڕابگیردرێ و، ئیتر تەڵاق بەدەمیا نەیەت، یان بەشێوەیەکی باش و بێهەرا دەس لێك بەردانە واتە: لەهیچ حاڵێکا نابێ ستەمی لێ بکات وبەخراپە ناوی بەرێت، کەوابوو تەڵاق سێ کەڕەتە، کەڕەتی یەکەم، ئەگەر هێمان ژنەکە لەماوەی عیددەدا بوو، ئەوەبێ نیکاحی تازە پیاوەکە ئەتوانێ بگێڕێتەوە لای‌خۆی ، کەڕەتی دووەمیش هەر بەوشێوەیە، ئەوجا بۆکەرەتی سێ یەم: یا ئەبێ بەرێکوپێکی لای خۆی ڕایبگرێ‌و، جارێکی تر تەڵاق نەخوا، وەیادەبێ بەچاکی‌و بێ‌هەرا تەڵاقی بداو، هیچ ستەمێکی لێنەکات ﴿ولا یحل لكم أن تأخذوا مما آتیتموهن شیئا﴾ وە بۆتان ڕەوا نییە "ئەی مێردەکان" کە لەو مارەییە بە ژنانەکانتان داوە هیچ شتێکیان لێ وەربگرنەوە"لە بەرامبەر تەڵاقەکەیانەوە" ﴿إلا أن یخافا ألا یقیما حدودالله﴾ مەگەر ئەوکاتە ژن وپیاوەکە بترسن کەنەتوانن سنوورەکانی خوا بەباشی ڕاگرن ﴿فإن خفتم ألا یقیما حدودالله﴾ خۆئەگەر ترستان هەبوو" ئەی قازییەکان:" کەئەو ژن وپیاوە سنوورەکانی خوا ڕاناگرن، هەمیشە هەراو کێشەیانە ﴿فلا جناح علیهما فیما افتدت به﴾ لەحاڵی ئاوادا هیچ گوناهێکیان ناگات، کە ژنەکە دەس لەمارەییەکەی خۆی هەڵبگرێ لە بەرامبەر تەڵاقەوەو، بەوەخۆی بگرێتەوە، واتە:" هەرکات گەیشتنە پلەی پێکەوە نەژیان، ژنەکە ئەتوانێ شتێك لەمارەیەکەی بدا، یان هەمووی بەمێردەکەی و تەڵاقی لێوەرگرێ، وخۆی ڕزگاربکا. ئەمەیە کە لەشەریعەتی ئیسلامدا پێی ئەڵێن (خولع- خۆدامالێنن لەدەس پیاوی ناچیزە) ﴿تلك حدود الله فلا تعتدوها﴾ ئەم تەڵاقدان و گێرانەوەی ژن بۆ ژێر ڕکێفی مێردو، یان خولع کردن لەگەڵیان.. هتد. گشت سنوورو یاسای خوان، کەوابوو لێیان دەر مەچن ﴿ومن یتعد حدودالله فأولئك هم الظالمون﴾ ئەوانەش کە لەسنوورەکانی خوا تێدەپەڕن ستەمکارن، بەڵێ لەسەردەمی جاهیلیەتا، بگرە تا دەمێکیش لەسەرهەڵدانی ئیسلاما تەڵاقدان سنوورێکی نەبوو، پیاوی واهەبوو دەجارو بیست جار ژنەکەی خۆی تەڵاق ئەداو ئەیگێڕایەوە بۆنیکاحی خۆی، تا ژنێ لەوانە سکاڵای بردە لای خاتوو عایشە (ڕەزای خوای لەسەر بێت)، ئەویش بۆ پێغەمبەری ﷺ گێڕایەوە، ئەوجا ئەم ئایەتەی: (الطلاق مرتان..)ی هات. لەم ئایەتەوە وەرگیرا کە سێ تەڵاقە بەیەك کەڕەت، وەك بڵێ: (أنت طالق ثلاثا) حەرامەو بیدعەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا جەماوەری زانایان سێ تەڵاقەکە بەیەك کەڕەت دەخەن، ئەوسا ئەگەر ژنانێك لەگەڵ پیاوەکەی خۆیدا پێکەوە نەدەگونجان، بۆ چارەسەری ئەمە لەفیقهی ئیسلامییدا بەناوی (خولع) ەوە هاتووە: کە ژنەکە دەتوانێ بەمارەییەکەی خۆی ئازاد بکا، لەوحاڵەتە گرژیی و ئاڵۆزییە کەلەگەڵ مێردەکەی دروستی کردووە، شیاوی باسە دەبێ ئەوەیش بزانین قسەی ڕاست ئەوەیەکە (خولع)

بەمانای تەلاقەو، ژمارەی تەلاقی پێ کەم ئەبێتەوە. بەلام ئاخۆ پیاو دەتوانێ زیاد لەوە وەختی خۆی کردوویەتی بەمارەیی ژنەکەی ئێستا لەبەرامبەر تەلاقەکەیەوە لێی بسێنێ؟ بۆئەمە حەنەفییەکان ئەڵێن: ئەگەر تەلاقەکە بەهۆی ناچێزەیی ئافرەتەکەوە بوو، ئەوە پیاوەکە کاتی خۆی چەندەی داوە بەمارەیی ژنەکەی ئێستاش ئەبێ هەر ئەوەی لێ وەربگرێتەوە، خۆ ئەگەر تاوان تاوانی پیاوەکە بوو، ئەوا نابێ لەباتی تەلاقەکە هیچ شتێکی لێوەرگرێ، بەڵکو دەبێ بەخۆرایی تەلاقی بدات، دیارە ئەم یاسای(خولع)ە بنەماو چارەسەرێکی زۆر باشە بۆ خۆ رزگارکردنی ژنان لەدەس پیاوان.

## دوای سێ تەلاقە ژنەکەی بۆ حەلاڵ نییە، مەر شوویەکی تر بکاو تەلاق بدرێ:

﴿[٢٣٠] فإن طلقها فلا تحل له من بعد حتى تنكح زوجا غيره﴾ ئینجا ئەگەر لەدوای ئەم دوو جارەش، بۆجاری سێیەم ژنەکەی تەلاقدا، ئەوە ئیتر جارێکی تر ئەو ژنەی بۆحەلاڵ نابێ تادەچێ شوو بە پیاوێکی تر دەکاو لەگەڵیشی دەس تێکەڵ دەکاو" ئەوسا بە ئارەزووی خۆیشی تەلاقی دەدات، یان دەمرێ، ئەوجا ئیتر ئەمیش دەتوانێ-پاش عیددە- مارەی بکاتەوە. هەر ئەمەیە"تەحلیل"ی شەرعیی کەلەقورئاندا هاتووە، ئیتر بێجگە لەمە بەهەر جۆرو شێوەیەکی تر ئەم مەسەلەیە دەسکاری بکرێ" ئەوە پێغەمبەر ﷺ بە" التيس المستعار" سابرینی خوازراو، ناوی بردووە و دەشفەرموێ: ((لعن الله المحلل والمحلل له)) مسند الإمام احمد ١/٤٥٠-٤٥١.واتە: نەحلەتی خوا لەهەردوو پیاوەکە-مێردی یەکەم و دووەم- کەوابوو جگە لەمە کەئایەتەکە خۆی دیاریکردووە گشت جۆرێکی تر، ناشەرعیی وناپەسەندەو حیلەو فرت و فێڵە، بۆیە ئەفەرموێ: ﴿فإن طلقها فلاجناح عليهما أن يتراجعا إن ظنا أن يقيما حدودالله﴾ خۆ ئەگەر ئەو مێردەی دووەمەیش "بەئارەزووی خۆی" تەلاقی دا ئەوساکە ئەوژن وپیاوە هیچ گوناهیان لەسەر نییە دووبارە بگەڕێنەوە لای یەکتر بۆ ژیانی ژنو مێردی، بەو مەرجەی کە وابزانن هەردووکیان دەتوانن سنوورەکانی خوا راگرن و"بەیەکەوە بژین" ﴿وتلك حدودالله يبينها لقوم يعلمون﴾ ئەم یاسایانە گشت سنووری خوان و، روونیان دەکاتەوە بۆئەوکەسانە بیر لەپاشەڕۆژی کارەکانیان دەکەنەوە. جاکەوابوو ژنی پاکتاوو سێ بەسێ کراو بەدوو مەرج نەبێ بۆ مێردەکەیحەلاڵ نابێتەوە، یەکەم: بەشێوەیەکی شەرعی مارە بکرێ لەپیاوێکی ترو دەسیشی لەگەڵ تێکەڵ بکا، ئەوسا یا بەئارەزووی خۆی تەلاقی بدا، یان بمرێ. دووەم: ئەبێ هەردوولا "ژن و پیاوەکە" یەقینیان هەبێت پاش گەڕانەوەکە دەتوانن پێکەوە بژین و ئەو حاڵەتەی پێشوو دووبارە نەبێتەوە.

## لەگەڵ ژنی تەلاقدراودا جوامێر بن:

﴿[٢٣١] وإذا طلقتم النساء فبلغن أجلهن﴾ ئەگەر ژنانتان تەلاقداو ماوەی حەیەو چاوەروانیان تەواوبوو، واتە:هێمان دەرفەتیان هەبوو بگەڕێنەوە لاتان ﴿فأمسكوهن بمعروف أو سرحوهن بمعروف﴾ ئەوسا ئێوەش یان بەشێوەیەکی چاك وجوامێرانە رایانگرن وبیانهێننەوە لایخۆتان وپێکەوە بژین، یان بەچاکی وشێوەیەکی جوان دەستیان لێ هەڵبگرن وتەلاقیان بدەن، بەلام وریابن مافیان نەخۆن ﴿ولا تمسكوهن ضرارا لتعتدوا﴾ ئیتر نابێ رایان بگرن و بەقەستی ئازاریان بدەن ، تا ناچاریان بکەن لەبەرامبەر تەلاق دانیانەوە مارەیی کەیانتان پێبدەن ﴿ومن يفعل ذلك فقد ظلم نفسه﴾ و هەرکەسێك كاری وابکات، بێگومان ستەمو ناهەقیی لەخۆی کردووە ﴿ولا تتخذوا آيات الله هزوا﴾ گشت ئەوانە نیشانەو سنووری خوان، نابێ ئێوەش بەلاقرتیی و گاڵتەوە بیانگرن ﴿واذكروا نعمة الله عليكم﴾ وەئەو نیعمەت و بەخششەی خوایە وەبیربێنن کە: پێغەمبەری بۆ ناردن ورێگای راستی نیشاندان وئامۆژگاری کردن

﴿وما أنزل عليكم من الحكمة﴾ هەروا ئەو كتێب ونامەو حيكمەتەش كە دابەزاندە خوارەوە بۆتان ﴿يعظكم به﴾ وئامۆژگاريتان پێيدەكات، وەبير بێنن و سوپاسيشی لەسەر بكەن ﴿واتقوا الله واعلموا ان الله بكل شئ عليم﴾ ئەشێ لەخوا بترسن و چاكيش بزانن كەبەراستيی خوا بە هەمو شتێك زاناو بەئاگايە. لەم ئايەتەدا وەرگيراوە كە: پياوی تەڵاقدەر بۆی حەڵاڵ نيە ژنەكەی بهێنێتەوە لای خۆی‌و ئازارو دەردەسەری بدا، تا ناچاری بكا دەس لەمارەييەكەی هەڵبگریٚ وتەڵاقی بەخۆرايی لێوەربگرێ، هەروەك سووكايەتی كردن بەئايەت‌و حوكمەكانی خواو تێنەپەڕاندنيان كارێكی حەرام و كوفرە.

**دەست مەهێننە ڕێی ژنان بچنەوە لای مێردی پێشوويان:**



وَإِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ
سَرِّحُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍۚ وَلَا تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَارًا لِّتَعْتَدُواْۚ وَمَن يَفْعَلْ
ذَٰلِكَ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُۥۚ وَلَا تَتَّخِذُوٓاْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ هُزُوًاۚ وَٱذْكُرُواْ
نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَمَآ أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ وَٱلْحِكْمَةِ
يَعِظُكُم بِهِۦۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴿٢٣١﴾
وَإِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحْنَ
أَزْوَٰجَهُنَّ إِذَا تَرَٰضَوْاْ بَيْنَهُم بِٱلْمَعْرُوفِۗ ذَٰلِكَ يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ
مِنكُمْ يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِۗ ذَٰلِكُمْ أَزْكَىٰ لَكُمْ وَأَطْهَرُۗ وَٱللَّهُ
يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٢٣٢﴾ ۞ وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ
حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِۖ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَۚ وَعَلَى ٱلْمَوْلُودِ لَهُۥ رِزْقُهُنَّ
وَكِسْوَتُهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِۚ لَا تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلَّا وُسْعَهَاۚ لَا تُضَآرَّ
وَٰلِدَةُۢ بِوَلَدِهَا وَلَا مَوْلُودٌ لَّهُۥ بِوَلَدِهِۦۚ وَعَلَى ٱلْوَارِثِ مِثْلُ ذَٰلِكَۗ
فَإِنْ أَرَادَا فِصَالًا عَن تَرَاضٍ مِّنْهُمَا وَتَشَاوُرٍ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَاۗ وَإِنْ
أَرَدتُّمْ أَن تَسْتَرْضِعُوٓاْ أَوْلَٰدَكُمْ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِذَا سَلَّمْتُم مَّآ
ءَاتَيْتُم بِٱلْمَعْرُوفِۗ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢٣٣﴾



﴿[٢٣٢] وإذا طلقتم النساء فبلغن اجلهن﴾ هەركە ژنانتان تەڵاقداو گەيشتنە ئاخر ماوەی دياريكراو بۆ عادەی مانگانەيان و، حەيە يان تەواو بوو ﴿فلا تعضلوهن أن ينكحن ازواجهن﴾ ئێوە ئەی كەس وكاری ژنان! ڕێيان لێ مەگرن شوو بە مێردە پێشووەكانيان بكەنەوە. ئيمامی (بوخاريی) لە(مەعقەلی كوڕی يەسار)ـەوە دەگێڕێتەوەودەڵێ: مەعقەل خوشكەكەی خۆی لە پياوێكی موسڵمان مارە كرد، ئەوجا پاش ماوەيەك تەڵاقی داو، عيدەيشی بەسەرچوو، پاشان حەزيان لەيەككردەوەو پياوەكە ڕۆيشت لە (مەعقەل)ی برای ژنەكە خوازبێنی كردەوە، ئەويش پێيگوت: بڕۆ ئەی ڕژدو چروك! من وەختی خۆی ژنم پێدايت تۆ تەڵاقت دا! سوێند بەخوا هەرگيز ناگەڕێتەوە لات، ئەوسا خوای گەورەش ئايەتی: (فلا تعضلوهن ان ينكحن أزواجهن)ی نارد، چونكە خوای گەورە دەيزانی كەئەو ژن وپياوە پێويستيان بەيەكتر هەيە، جاكاتێكيش (مەعقەل) ئايەتەكەی بيست وتی: خوايە ئەوا بيستم و فەرمانتم بەجێ هێنا، لەپاشان كابرای بانگكردو خوشكەكەی بۆ مارەكردەوە. ﴿إذا ترضوا بينهم بالمعروف﴾ بە مەرجێ كە لەگەڵ هاوجووتی پێشوويياندا ڕێككەوتن" واتە: هەر ئافرەتێك تەڵاق درا، پاشان مێردە پێشووەكەی خواستيەوەو بەيەكيش ڕازييبوون، دەبێ كەس و كارەكەی دەست نەهێننە ڕێگای و بۆی مارە بكەنەوە. ﴿ذلك يوعظ به من كان منكم يؤمن بالله واليوم الآخر﴾ كێ لەئێوە بڕوای بەخواو بەڕۆژی سەڵا هەبێ ئەم ئامۆژگارييە دەبيسێ‌و كاری پێدەكات ﴿ذلكم ازكى لكم واطهر﴾ ئەوانە سووديان بۆتان هەيەو دەبنە بەهرەی پاكيتان ﴿والله يعلم وانتم لا تعلمون﴾ خواچاك دەزانێ چ شتێك بۆئێوە چاكە، بەڵام ئێوە سەری لێ دەرناكەن نايزانن.

لەو ئايەتەوە ئەم چەند شتە گرنگەيە وەردەگيرێ:

(١) ڕێگرتن لە ژنی تەڵاق دراو هەر كەويستی بگەڕێتەوە لای مێردە پێشوەكەی كارێكە حەرامە.

(٢) (ولیی) و سەرپەرشتیکار بۆ ژنان – بەتایبەت بۆ نیکاح –واجیب و پێویستە، چونکە کە خوا دەفەرموێ (ولا تعضلوهن)، لەگەڵ سەرپەرشتکارانی ژنانیەتی.

(٣) پەندو ئامۆژگاریی بۆیەکتر، گەلێ کەڵك بەخش و بەسوودە.

**دەبێ تەنها دوو ساڵ شیر بە منداڵ بدرێت:**

﴿[٢٣٣] والوالدات یرضعن اولادهن حولین کاملین﴾ دایکان تادوو ساڵی تەواو دەتوانن شیر بەمناڵەکانیان بدەن، واتە: نابێ لەدووساڵ تێپەڕێ، خۆ ئەگەر لەوماوەیە کەمتر بێت قەیناکات، چونکە دەتوانن ئەویش بەپێی باوونەریتی ناوچەکەو بەرژەوەندی خۆیان رەچاو بکەن ﴿لمن اراد ان یتم الرضاعة﴾ ئەو دووساڵەیش بۆ کەسێکە کە بیەوێ دەورانی شیرپێدان تەواو بکات" ئەگینا دووساڵ شیرپێدان پێویست نییە بەڵێ لەسەر باوك پێویستە شیردەرێك بۆ منداڵەکەی پەیدا بکات، ئیتر دایکی مناڵەکە خۆی بێ، وەیان هەر ژنێکی تر بێ، دیارە هەر دایکەکەی خۆی چاکترە هەرچەندە تەڵاقیش درابێت" ﴿وعلی المولود له رزقهن وکسوتهن بالمعروف﴾ لەوماوەدا ئازووقەو جلكو پۆشاکی ئەودایکە شیردەرەیە "تەڵاق درابێ یانە" لەسەر باوکی منداڵەکەیە، دەبێ بەشێوەیەکی جوان و بەپێی باوی موسڵمانانی ئەوشوێنە ئەنجام بدرێت ﴿لاتکلف نفس إلا وسعها﴾ دیارە هیچ کەسێك بەدەر لەتوانا خۆی تەکلیف وداوای لێ ناکرێ ؟ چونکە ﴿لا تضار والدة بولدها﴾ هیچ دایکێك لەبەر دژایەتی کردن لەگەڵ باوکی ئەو منداڵەدا مافی زیان گەیاندنی بەمناڵەکەی نییە" واتە: مناڵەکەی لێ بسەنرێتەوە، یان ئازووقەی کەمی بدرێتی" ﴿ولا مولود له بولده﴾ هەروا خاوەنی مناڵەکەیش، واتە (باوکی منداڵەکە) نابێ زیانی پێ بگات ﴿وعلی الوارث مثل ذلك﴾ ئەگەر منداڵ باوکی نەبوو لەسەر میرات بەرەکەی پێویستە جلكو بژێوی دایکەکەی فەراهەم کەن، هەرچۆنێ لەسەر باوکەکە پێویست بوو ﴿فإن ارادا فصالا عن تراض منهما وتشاور﴾ خۆ ئەگەر دایك وباوك "هەردوو" بەرەزامەندی وراوێژ لەگەڵ یەکتر ویستیان زووتر مناڵ لەشیر بگرنەوە ﴿فلاجناح علیهما﴾ ئەوە هیچ گوناهێکیان ناگات بەڵام، یەکێکیان "بەتەنها"بۆی نییە بریاری برانەوەی بدات ﴿وإن اردتم ان تسترضعوا اولادکم﴾ خۆ ئەگەر ویستان دایەن شیر بداتە منداڵەکانتان لەبەرئەوە کە خۆی شیری نەبوو، یان هەر شیری پێ نەئەدا، وەیان لەبەر هەر هۆیەکی تربێ ﴿فلا جناح علیکم إذا سلمتم ما آتیتم بالمعروف﴾ بەمەرجێك بەپێی دابی رۆژ کرێیان بدەنێ، هیچ گوناهێکتان ناگات ﴿واتقوا الله واعلموا ان الله بما تعملون بصیر﴾ دەبێ لە نافەرمانی خوا شەرم بکەن و پارێزتان هەبێ و یاساکانی ئەو پشتگوێ نەخەن، وەچاکیش بزانن کە بێگومان خوا بەگشت کردەوەکانتان بینایەو، هیچی لێ ون نابێت.

**رێنمایی یەکانی ئەم ئایەتە:**

١) لەسەر گشت دایکێك– ئەگەرچی تەڵاق دراویش بێ– پێویستە مناڵەکەی گۆش بکا، ئەوجا ئەگەر ویستی تەسلیمی خاوەنەکەی بکاتەوە.

٢) لای سەرووی ماوەی شیرپێدان ، دووساڵی رەبەقە، بەبەڵگەی فەرموودەی: ((لا رضاع بعد فصال، ولا یتم بعد احتلام)) ئەبوداود. وە بەپێی فەرموودەی ((لا یحرم من الرضاع إلا ماکان من الحولین)) بوخاریی.

٣) وەرگرتنی کرێ ومزە بۆشیرپێدان، حەڵاڵ و رەوایە.

٤) خزمانی نزیك –لە حاڵی هەژارییدا– نەفەقەیان لەسەر یەکترە.

٥– باوك ، یامیراتگریی باوك، دەتوانن دایەن بۆ مناڵەکە بگرن. ئەگەر بەرژەوەندی کۆرپەلەو ساواکەی تێدابوو.

### ژنی شوو مردوو، ده‌بێ چوار مانگ و ده رۆژ چاوه‌روان بێت:

﴿[٢٣٤] والذین یتوفون منکم﴾ ئه‌وپیاوانه‌ی لێتان ئه‌مرن ﴿ویذرون ازواجا﴾ و ژنه‌کانیان به‌جێ دێڵن، ئیتر له‌گه‌ڵیاندا خه‌وتبن، یان نا ﴿یتربصن بأنفسهن اربعه اشهر وعشرا﴾ ئه‌بێ -ئه‌و ژنانه- چوار مانگ وده‌شه‌و چاوه‌ڕوابن، " له‌وماوه‌یه‌شدا ته‌نانه‌ت نابێ خۆشیان ئارایيش بده‌ن، واته: وه‌ك ژنێك خه‌یاڵی مێردکردنی هه‌بێ خۆ نیشان نه‌ده‌ن ﴿فإذا بلغن اجلهن﴾ ئینجا هه‌رکه گه‌یشتنه کۆتا ماوه‌یان و عیده‌یان بڕایه‌وه ﴿فلا جناح علیکم فیما فعلن فی انفسهن بالمعروف﴾ له‌وه به‌ولاوه ئیتر هه‌رکارێکی په‌سه‌ندو شه‌رعیی به‌خۆ بکه‌ن ، قه‌یناکاو گوناحێ بۆ ئێوه نیه ئه‌ی خاوه‌ن ژنه‌کان ! ئه‌ی کۆمه‌ڵی موسڵمانان! واته: ئه‌گه‌ر "پاش ئه‌وه" به پێی یاسای ئیسلام و باوی وڵات" خۆیان نیشان بده‌ن و خۆ بڕازێننه‌وه‌و خۆ ئاماده بکه‌ن بۆ شووکردن قه‌یناکا ﴿والله بما تعملون خبیر﴾ خۆ ئێوه‌ش هه‌رکارێ بکه‌ن، خوا پێی ئاگایه.

رێنمایی ئه‌م ئایه‌ته‌ی (٢٣٤):

١- ژنی مێرد مردوو، ده‌بێ چوار مانگ و ده‌رۆژی هیجری قه‌مه‌ریی چاوه‌ڕوان بێ وعیدده‌ی خۆی رابگرێ .

٢- ئه‌گه‌ر ژنێك مێرده‌که‌ی نادیارو(مفقود) بوو، ئاخۆ بۆ راگرتنی ماوه‌ی عیدده‌که‌ی هه‌ر له‌و رۆژه‌وه که مردووه عیده‌ی خۆی ده‌ژمێرێ، یا له‌و رۆژه‌وه که هه‌واڵی مردنه‌که‌ی گه‌یشتووه؟ قسه‌ی راست" بۆ ئه‌م مه‌سه‌له‌یه "ئه‌وه‌یه که هه‌ر له رۆژی مردنه‌که‌یه‌وه عیدده‌ی راده‌گرێ و بۆی حسێب ده‌کرێ.

٣- ژنانی ته‌ڵاق دراویش" وه‌ك ژنانی مێرد مردوو، ده‌بێ خۆ ئارایش نه‌ده‌ن و خۆ نه‌ڕازێننه‌وه‌و، له‌ماڵیش نه‌چنه ده‌رێ تا عیدده‌که‌یان ته‌واوئه‌که‌ن.

الجزء الثاني — سورة البقرة

وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ
أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ
فِيمَا فَعَلْنَ فِي أَنفُسِهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ
(٢٣٤) وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا عَرَّضْتُم بِهِ مِنْ خِطْبَةِ النِّسَاءِ
أَوْ أَكْنَنتُمْ فِي أَنفُسِكُمْ عَلِمَ اللَّهُ أَنَّكُمْ سَتَذْكُرُونَهُنَّ
وَلَٰكِن لَّا تُوَاعِدُوهُنَّ سِرًّا إِلَّا أَن تَقُولُوا قَوْلًا مَّعْرُوفًا
وَلَا تَعْزِمُوا عُقْدَةَ النِّكَاحِ حَتَّىٰ يَبْلُغَ الْكِتَابُ أَجَلَهُ
وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي أَنفُسِكُمْ فَاحْذَرُوهُ وَاعْلَمُوا
أَنَّ اللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ (٢٣٥) لَّا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ
مَا لَمْ تَمَسُّوهُنَّ أَوْ تَفْرِضُوا لَهُنَّ فَرِيضَةً وَمَتِّعُوهُنَّ عَلَى الْمُوسِعِ
قَدَرُهُ وَعَلَى الْمُقْتِرِ قَدَرُهُ مَتَاعًا بِالْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى الْمُحْسِنِينَ
(٢٣٦) وَإِن طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ وَقَدْ فَرَضْتُمْ
لَهُنَّ فَرِيضَةً فَنِصْفُ مَا فَرَضْتُمْ إِلَّا أَن يَعْفُونَ أَوْ يَعْفُوَ
الَّذِي بِيَدِهِ عُقْدَةُ النِّكَاحِ وَأَن تَعْفُوا أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ
وَلَا تَنسَوُا الْفَضْلَ بَيْنَكُمْ إِنَّ اللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ (٢٣٧)

٣٨ — حَافِظُوا عَلَى

### ژنی شوو مردوو ده‌بێ ناراسته‌وخۆ بخوازرێ:

﴿[٢٣٥] ولا جناح علیکم فیما عرضتم به من خطبة النساء﴾ هیچ گوناهێکتان له‌سه‌ر نیه له خواستنی ژنه مێرد مردووه‌کاندا (به‌کینایه)و ناراسته‌وخۆ، له‌ماوه‌ی حه‌یه وعیده‌دا ، وه‌کو ئه‌وه بڵێت: ئه‌گه‌ر خوا بۆم رێك بخات ده‌مه‌وێ ئافره‌تێکی چاك بخوازم ﴿او اکننتم فی انفسکم﴾ یان به‌دڵ حه‌زیان لێ بکه‌ن و بڕیاربده‌ن که‌ماره‌یان بکه‌ن و، نه‌یخه‌نه ڕوو ﴿علم الله انکم ستذکرونهن﴾ چونکه خوا خۆی چاك ده‌زانێ که ئێوه (به‌پێی سروشت) هه‌رناویان ئه‌به‌ن وباسیان ئه‌که‌ن و، تواناتان نیه به‌رامبه‌ریان خۆتان رابگرن، هه‌ر بۆیه خوایش ره‌وایدا که به ناراسته‌خۆ داوایان بکه‌ن، یان له‌دڵتاندا هه‌بن ﴿ولکن لا تواعدوهن سرا﴾ به‌ڵام نه‌که‌ن به نهێنی وژێر به‌ژێریی به‌ڵێنیان بده‌نێ، واته: له ژێر په‌رده‌وه په‌یمانیان لێ وه‌رمه‌گرن که‌ده‌بێ ته‌نها به‌ئێوه شوو بکه‌ن ﴿إلا ان تقولوا قولا معروفا﴾ مه‌گه‌ر به‌قسه‌یه‌کی په‌سه‌ندو گونجاوو چاك ودروست، که‌س وکاریان بدوێنن، پێیان بڵێن: عیدده‌ی ته‌واوکرد ئاگادارم بکه‌ن، واته: نابێ ئه‌و ژنانه مێردیان مردووه، له‌ماوه‌ی عیدده‌یاندا

بۆ خواستنیان قسەیان لەگەڵ بکرێ، مەگەر بەشێوەی خستنە پێشچاوو هێماو (تەعریض)، یان کەس وکاریان ئاگادار بکرێت ﴿ولا تعزموا عقدة النكاح حتى يبلغ الكتاب اجله﴾ باسی مارەکردنیان مەکەن تاماوەی عیددەکەیان -چوارمانگ ودەشەوەکە-تەواو دەبێت ﴿واعلموا أن الله يعلم ما في انفسكم فاحذروه﴾ دەبێ چاکیش بزانن کە بەراستی خوای گەورە دەزانێت ئێوە چیتان لە دڵدایە، کەوابوو لەوەی قەدەغەیە خۆتان دوور بگرن و خۆلادەن ﴿واعلموا أن الله غفور حليم﴾ بشزانن کە بێگومان خوا لەگوناهان لێبوردەیەو، زۆریش لەسەر خۆیە، ئێستا پەلە ناکاو تۆڵەتان لێ ناسێنێ.

رینمایی ئایەتی (٢٣٥):

١- خواستنی ژنان لەماوەی حەیەوعیددەدا حەرامە.

٢- ئەگەر پێش تەواوبونی عیددەیاندا مارەکران، ئەو مارەکردنە بەتاڵەو,دەبێ لێك جیابکرێنەوە، پاشان بۆی مارەبکرێتەوە.

٣- لەهەموو ئیش وکارێکدا، دەبێ (الله)مان لەپێش چاوبێ.

**تەڵاقدانی ژنان بەر لەنووستن لەگەڵیاندا :**

﴿[٢٣٦] لا جناح عليكم إن طلقتم النساء﴾ ئەگەر لەگەڵ ژنەکانتاندا نەگونجان و تەڵاقتاندان، گوناحێکتان ناگات ﴿ما لم تمسوهن او تفرضوا لهن فريضة﴾ پێش ئەوە نزیکیتان لەگەڵ کردبن و مارەیەکتان بۆ دیاریکردبن ، واتە: تەڵاقدانی ژن "پێش چوونەلایی و، پێش دیاریکردنی مارەیی بۆی، گوناهی نیەو هیچیشیان ناکەوێ ﴿ومتعوهن﴾ دەبێ لەماڵی خۆتان یارمەتیەکیان بدەنێ ﴿على الموسع قدره وعلى المقتر قدره﴾ لەوەشدا دەستدار بە پێی توانای خۆیی و، هەژارو دەسکورتیش ، هەر بەئەندازەی توانای خۆی ﴿متاعا بالمعروف﴾ ئەم شتەش شیاوو خوا پەسەند بێ و بەپێی باوی موسڵمانانی ناوچە ﴿حقا على المحسنين﴾ لەسەر چاکەکاران مافێکی پێویستە. بەڵێ ئەم موتعەیە بۆ هەرژنێك پێش گواستنەوە تەڵاق بدرێ، واجیب و پێویستە، بەڵام بۆ ژنانی تەڵاقدراوی پاش گواستنەوە سوونەتە.

رێنمایی ئایەتی (٢٣٦):

١- ژنانی تەڵاقدراو پێش نزیکی لەگەڵ کردنیان و، پێشدانانی مارەیی بۆیان (موتعە)یان بۆ واجیبەو دیاریکردنی ریژەکەشی بەپێی بوون و" نەبوونی تەڵاقدەرەکەیە.

٢- ئەگەر ئافرەتێکی ئاوای بێ‌مارە، مێردەکەی بمرێ، ئایا (مهرالمثل)ی بۆدادەنرێ، یان تەنیا میرات دەباو عیددە رادەگرێ ؟ لەوەڵاما دەڵێین: ئەگەر بەپێی (قیاس) بێت مارەیی بۆ دانانرێ، بەڵام ئیمامی (تیرمیزی) فەرموودەیەکی هێناوە سەبارەت بە دانانی مارەیی بۆئەو جۆرە ژنانە کە:(مهر المثل)یان بۆدادەنرێت.

**ژن بەر لە نوستن تەڵاق بدرێت، نیوەی مارەیی دەبا :**

لەم چەند ئایەتەدا خوای کارزان باسی ئەو ژنانە دەکات کەبەر لەسەر جێیی لەگەڵ کردن تەڵاق دەدرێن: ﴿[٢٣٧] وان طلقتموهن من قبل ان تمسوهن﴾ ئەگەر ئێوەپێش چوونە لای ژنەکانتان، تەڵاقتاندان ﴿وقد فرضتم لهن فريضة﴾ و مارەییشتان بۆ دیاری کردبوون ﴿فنصف ما فرضتم﴾ دیارە نیوەی ئەومارەیی یەیان دەکەوێ بۆتان دیاری کردوون، شیاوی باسیشە ئەگەر لەم حاڵەتەدا مێردەکە پێش ژنەکەی مرد، ئەوا ژنەکە تەواوی مارەیی یەکەی ئەبات، خۆ ئەگەر ژنەکە پێش مێردەکەی مرد، دیسانەوە هەر تەواوی مارەیی یەکە ئەڕوات بۆمیرات بەرانی ژنەکە

﴿إلا أن يعفون او يعفو الذى بيده عقدة النكاح﴾ مەگەر ژنەكان خۆیان چاوپۆشیتان لێبكەن ومافی خۆیانتان پێببەخشن، یان ئەوكەسە گرێدانی مارەكردنەكەی بەدەستە چاوپۆشی بكات، واتە: مەگەر ژنەكە خۆی بڵێ: هیچم ناوێ لێی، یان مێردەكە گشتی مارەییەكەی بداتێ. (تەبەریی) دەڵێت: ئەو كەسەی مارەكردنەكەی بەدەستە مێردەكە دەگرێتەوە، هەندێكیش دەڵێن نەخێر مێردەكە ناگرێتەوە، بەڵكو مەبەست پێی سەرپەرشتیارو (وەلیی) ژنەكەیە. ﴿وان تعفوا اقرب للتقوى﴾ خۆ ئەگەر ئێوە (ئەی پیاوان) ژنان ببوورن‌و، هەموومارەییەكەیان بدەنێ، وەیان ئێوە ئەی ژنان! دەست لەنیوەكەی خۆتان هەڵبگرن و هیچ لەپیاوەكەتان نەسێنن، بێ شك هەردوو بارەكە پەسەندەو بە ئاكاری تەقوادارانەوە نزیكترە ﴿ولا تنسوا الفضل بينكم﴾ ناشبێ لێبووردوویی و كارچاكی و پیاوەتی نێوانتان لەبیربكەن، واتە: ئەگەر كەسێك ژنێكی تەڵاقدا، با ڕابردووی ژنەكەومالّی خەزوورانی لەبیرنەچێتەوە، بەجۆرێ كارەكانی ئەنجام بدات ، ریعایەتیان بكات ﴿إن الله بما تعملون بصير﴾ بێگومان خوا بینایە بەهەركارێ ئێوە دەیكەن.

ڕێنمایی ئایەتی (٢٣٧):

١- ژنێكی مارەیی دیاریی بۆ كراوو تەڵاق دراوی پێش لەگەڵ نوستووو ، نیوەی مارەییەكەی دەكەوێ، مەگەر ژنەكە خۆی لێیدابەزێ و نەیەوێ ، هەروەك پیاوەكەش بە ڕەزامەندی خۆی دەتوانێ دەس لە نیوەكەی خۆی هەڵبگرێ‌و بیبەخشێ بەژنەكە.

٢- هێشتنەوەی ئاكاری چاك وپیاوەتی لە نێوان هەردوو خێزانەكەدا (كەس وكاری ژنە تەڵاق دراوەكەو، پیاوە تەڵاق دەرەكە) كارێكی پێویستە

بە كورتیی و پوختە: بۆ ژنانی تەڵاقدراو چوار حاڵەت هەیە: یەكەم: لەگەڵ نەنووستوو مارەیی دیاریی بۆ نەكراو، ئەم جۆرەیان (موتعە) یان دەكەوێ و، عیدەیان لەسەر نیە، دووەم: ژنێك بەرلە دەست تێكەڵكردن لەگەڵیاو، دوای دیاریكردنی مارەیی بۆی ، تەڵاق بدرێ، نیوەی مارەییەكەی دەبا (مەگەر مێردەكەی ئەو نیوەكەشی بۆ زیادبكا) عیدەشی لەسەر نیە، سێیەم: تەڵاق دراویی لەگەڵ نوستووو، مارە بۆ دیارییكراو، هەموو مارەییەكەی دەباو، عیدەشی دەكەوێتە سەر. چوارەم: تەڵاقدراویی لەگەڵ جووت بووی بێ مارەیی، دیارە ئەمەش (مهر المثل) ی دەكەوێ و، دەبێ عیدەش ڕابگرێ.

**نوێژەكان (بە تایبەتی نوێژی ناوەنجیی) بپارێزن:**

لەم ئایەتەشدا خوای كارجوان فەرمان دەدات بە ڕاگرتنی گشت نوێژەكان: ﴿[٢٣٨] حافظوا على الصلوات﴾ هەموو نوێژەكان بپارێزن‌و، لەكاتی خۆیاندا ئەنجامیان بدەن و، مەیانفەوتێنن ﴿والصلاة الوسطى﴾ لەناویاندا گرنگی بە نوێژە ناوەڕاستەكە بدەن.

سەرنجێك: لەناو زاناكاندا ئیختیلاف و جیاوازییەك -سەبارەت بە دیاریكردنی ئەو نوێژە ناوەندیی‌و ناوەڕاستەیە- هەیە, بەڵام ڕای بەهێزیان ئەوەیە كە ئەو نوێژە ناوەنجییە نوێژی عەسرە ﴿وقوموا لله قانتين﴾ هەمیشە بەملكەچیەوە بە فەرمانی خوا هەستن‌و، بێ دەنگ‌و بەترسەوە نوێژ بكەن.

**نوێژی ترس و تەنگانە:**

لەم ئایەتەشدا باسێكی كورتی نوێژی ترس وتەنگانە دەكات:﴿[٢٣٩] فإن خفتم فرجالا او ركبانا﴾ ئینجا ئەگەر ئێوە لەجەنگ ، یان لە هەرشتێكی تردا ترستان هەبوو، بۆتانیش نەدەكرا بەشێوەی ئاسایی نوێژەكان بكەن،

دەتوانن بەپیادەیی، یان بەسواریی، بییانخوێنن وئەنجامیان بدەن، ئیتر رووتان لەرووگەوە بێت، یان نا ﴿فإذا أمنتم﴾ جاکە ترستان نەماو ئەمین بوونەوە، واتە: وەزعتان ئاسایی بوویەوە ﴿فاذكروا الله كما علمكم مالم تكونوا تعلمون﴾ ئینجا هەرچۆنێ خوا فێری ئەوشتانەی کردون و جاران نەتان دەزانین، یادی خوابکەن ، واتە: بەشێوەی ئاسایی نوێژەکانتان بکەن.

**رێنمایی ئایەتی: (٢٣٨-٢٣٩):**

١-ئەبێ هەموو نوێژەکان- بەتایبەتی نوێژی عەسران و بەیانیان- لەکاتی خۆیانداو بەهەموو مەرجەکانیشیانەوە ئەنجام بدرێن.

٢--قسەی راست لە دیاریکردنی ئەو نوێژە ناوەنجییەدا -بە بەڵگەی ئەو فەرموودە سەحیحەی: (شغلونا عن الصلاة الوسطى صلاة العصر)- ئەوەیە کە ئەو نوێژە ناوەراستە، نوێژی عەسرە.

٣- زەلیلی و ملکەچکردن"بەتایبەتی لە کاتی نوێژەکاندا" بۆخوای خاوەن دەسەڵات واجیبە.

٤- نوێژی ترس(صلاة الخوف) ئیتر لە بەر هەر شتێ ببێ، نوێژخوێن دەتوانێ بە پیادەیی ، یان بە سواری ئەنجامی بدات، بۆ پتر زانیاریی لەم نوێژە، لەئایەتی: (١٠٢)ی سوورەتی (نیساء)دا هەموو جۆرەکانی (صلاة الخوف) باسکراوە.

**تێبینی:** بۆیە کتوپڕ باسی نوێژی هێنایەکایەوە، هەتا هەمووان بزانن هەر کەکاتی نوێژ پێشهات، دەبێ بەخێرایی دەس لەهەموو ئیش و کارێک هەڵبگرین و بڕۆین بەلای نوێژەکانەوە. ﴿[٢٤٠] والذين يتوفون منكم ويذرون أزواجا وصية لأزواجهم متاعا إلى الحول غير إخراج﴾ ئەو کەسانە لە ئێوە لەسەرە مەرگدان ودەمرن وژنەکانیان دوای خۆیان بەجێ دێڵن، با پێش ئەوەی گیانیان دەربچێ راسپێرن و وەصیەت بکەن کە ژنەکانیان" ئەگەر ویستیان" تاماوەی ساڵێک دەرنەکرێن و هەر لەجێی خۆیان بمێننەوەو خەرجیان بدەن" بەڵێ.. لەسەرەتای هاتنی دینی ئیسلامدا ژنی مێردمردو دەبوو بەو شێوە رەفتاری لەگەڵ کرابا" بەلاَم دوایی هەر بەئایەتی (٢٣٤)ی ئەم سورەتە ئەو بڕیارو حوکمە سڕایەوەو گۆرا بەچوارمانگ و دەرۆژ ﴿فإن خرجن فلا جناح عليكم فيما فعلن في أنفسهن من معروف﴾ خۆ ئەگەر بەویستی خۆیان دەرچوون، (دیارە مافی خەرجییان نامێنێ) و گوناحێکیش لەسەر ئێوە نییە سەبارەت بەهەر کارێکی خوا پەسەندوو شیاو بۆ خۆتان دەیکەن " ئەگەر دوای عیددەش خۆیان نیشان بدەن بۆ شووکردن ئەوەشیان بۆ هەیە" ﴿والله عزيز حكيم﴾ خوا باڵادەست و ، کارجوان و کاردروستە، بیەوێ هەر شتێ بکا ئەیکات و هەموویشی خێرە ﴿[٢٤١] وللمطلقات متاع بالمعروف﴾ بۆ هەموو ژنانی تەڵاقدراو، موتعەیەکی گونجاوو رەوا ، واجیب

الجزء الثاني — سورة البقرة

حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ وَقُومُواْ لِلَّهِ قَٰنِتِينَ ﴿٢٣٨﴾ فَإِنْ خِفْتُمْ فَرِجَالًا أَوْ رُكْبَانًا فَإِذَآ أَمِنتُمْ فَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ كَمَا عَلَّمَكُم مَّا لَمْ تَكُونُواْ تَعْلَمُونَ ﴿٢٣٩﴾ وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا وَصِيَّةً لِّأَزْوَٰجِهِم مَّتَٰعًا إِلَى ٱلْحَوْلِ غَيْرَ إِخْرَاجٍ فَإِنْ خَرَجْنَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِى مَا فَعَلْنَ فِىٓ أَنفُسِهِنَّ مِن مَّعْرُوفٍ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٤٠﴾ وَلِلْمُطَلَّقَٰتِ مَتَٰعٌۢ بِٱلْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٢٤١﴾ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٢٤٢﴾ ۞ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ خَرَجُواْ مِن دِيَٰرِهِمْ وَهُمْ أُلُوفٌ حَذَرَ ٱلْمَوْتِ فَقَالَ لَهُمُ ٱللَّهُ مُوتُواْ ثُمَّ أَحْيَٰهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ ﴿٢٤٣﴾ وَقَٰتِلُواْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٤٤﴾ مَّن ذَا ٱلَّذِى يُقْرِضُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥٓ أَضْعَافًا كَثِيرَةً وَٱللَّهُ يَقْبِضُ وَيَبْصُۜطُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢٤٥﴾

ربع الحزب ٤

٣٩

و پێویستە "دیارە بەتایبەتی ئەوانەیان کە مێردیان لەگەڵ نەخەوتووەو مارەییشیان بۆ دیاری نەکراوە ﴿حقا على المتقين﴾ ئەم کارە لەسەر پیاوانی پارێزکارو لە خوا ترس بڕیارە (عەبدولرەحمانی کوری زەید) دەڵێ: کەئایەتی: (متاعا بالمعروف حقا على المحسنين) هات، پیاوێك گووتی: کەوابوو ئەگەر خێرم ویست، موتعەی دەدەمێ، ئەگەرنا نایدەمێ، پاش ئەو قسەیە ئەم ئایەتە: (وللمطلقات متاع بالمعروف حقا على المتقين) هات. ئەو زانایانە کەئەم ئایەتە دەکەنە بەڵگەی واجیبی موتعە، دەڵێن: هەموو ژنێکی تەڵاقدراو هەقی موتعەی هەیە ﴿[٢٤٢] كذلك يبين الله لكم آياته﴾ هەر ئا بەو شێوەیە خوای گەورە نیشانەو یاساکانی خۆی لە بارەی تەڵاق و خولع وشیردانەوە..هتد بۆ ئێوە ڕۆشن دەکاتەوە ﴿لعلكم تعقلون﴾ بەڵکو ئێوە بیربکەنەوەو تێ بگەن.

ڕێنمایی ئایەتی(٢٤٠-٢٤١):

١- دەبێ پیاوان لەسەرەمەرگدا وەسیەت بکەن کە ژنەکانیان "پاش خۆیان" تا ساڵێ لەو ماڵەدا "تێیدا ژیاون" دەرنەکرێن وخەرجیش بدرێن، ئەگەر خۆیان پێیان خۆش بوو. ئیمامی تەبەریی ئەڵێ: ئەم ئایەتە بۆ ژنانی مێردمردوو ڕەحمەتە وحوکمەکەشی هەربەردەوامە، (شيخ الإسلام/ ئیبن تەیمیە) و(ئیبن قە ییم)یش هەروا دەڵێن.

٢- (موتعە)یش دەبێ شتێکی وەهابێ شیاوی ژنی تەڵاقدراو بێت، دیارە کە هەرکەسەیش بەپێی تواناو دەسەڵاتی خۆیەتی.

**هەزاران کەس لە ترسی مردن لەزێدی خۆیان هەڵهاتن!:**

بەڵێ.. دەبێ هەموان دڵنیابن کە مردنی هەمووگەڵێك ، بەدەست کێشانەوەیەتی لەجیهاد، چونکە هەرگەلێ جیهادنەکا، زۆر بەئاسانی دوژمن زاڵ دەبێ بەسەریاو ریسواو ژێر دەستەی ئەکاو خێروبێری ولاتەکەشی دەخوات، زیندووکردنەوەیشی هەر بە ڕاپەڕین و ڕوو بەڕووبوونەوەیە لەگەڵ دوژمن، ئەها خوا دەفەرمویێ: ﴿[٢٤٣] الم تر إلى الذين خر جوا من ديارهم وهم الوف حذر الموت﴾ ئەرێ تۆ ئەوانەت نەدیت کە بەهەزاران کە سبوون و، ترسی مەرگ وای لێکردن ولات ونیشتمانی خۆیان بەجێ بهێڵن و لە جیهاد -بەبیانووی (تاعوون) ەوە-هەڵبێن؟! ﴿فقال لهم الله موتوا﴾ خوایش پێی فەرموون دەسا بمرن! ئەوانیش هەموو مردن ﴿ثم أحياهم﴾ پاشان لەسەر داوای پێغەمبەرەکەیان زیندووی کردنەوەو، گیانی جیهادی کردەوە بە بەریاناو پەلاماریانداو خۆیان رزگار کردەوە ﴿إن الله لذو فضل على الناس﴾ بێگومان خوا سەبارەت بە خەڵکیی خاوەن فەزڵ و بەخششە، بەیناو بەین تووشیان دەکا، هەتا لەخەوی خەفڵەت وەخەبەر بێن ﴿ولكن اكثر الناس لايشكرون﴾ بەڵام زۆربەی خەڵکی سوپاسگوزار نابن. (سەید قوتب) دەڵێ: پێویست ناکات بگەڕێین بە دوای ئەوانەدا هەڵهاتن ، تابزانین کێ بوون؟ وە یان لەکوێ بوون؟ ئەگەرچی هەندێ قسەوباسیش هەبێ، چونکە ئەگەر زانینی پێویست بوایە، دڵنیابە خوا روونی دەکردەوە.

ڕینمایی ئایەتی (٢٤٣):

١-هەرکە تاعوون و چاوەقووڵە و هەرپەتایەکی تر کەوتە ناوچەیەکەوە، نابێ خەڵکی ئەو ناوچەیە هەڵبێن و بچن بۆ ولاتێکی دی، وەکو ئەم فەرموودە -ئیمامی (ترمزیی) هێناویەتی- دەڵێت: ((بَقِيَّةُ رِجْزٍ أو عذابٍ أُرْسِلَ على طائفةٍ من بني إسرائيل، فإذا وَقَعَ بأرض وأنتم بها فلا تَخْرُجوا منها، وإذا وقع بأرض ولَسْتُمْ بها فلا تَهْبِطُوا عليها)) ئەو سزاو جەزرەبەیە بەسەر بەنی ئیسرائیلدا هات، لای پێغەمبەرا ﷺ باسکرا ، ئەویش فەرمووی: هەرکات لە جێگایەکدا ئەوسزایە پێشهات و، ئێوەیش لەوێ بوون، دەبێ هەر لەوێ بمێننەوەو دەرنەپەڕێن، خۆ ئەگەر لەوێ نەبوون، مەچن بۆ ئەو شوێنە. ﴿[٢٤٤] وقاتلوا في سبيل الله﴾ ئیتر هەرگیز مەترسن و لە ڕێگای خوا بجەنگێن

﴿واعلموا أن الله سميع عليم﴾ چاك بزانن كه بەراستیی خوا ژنەواو زانایه، ئازاو ترسنۆك ئەناسێ ﴿[٢٤٥] من ذا الذی یقرض الله قرضا حسنا﴾ كێ ماڵی خۆی بە قەرز دەدا بەخوا، لەپێناوی سەرخستنی دینی خوادا، بەخشینێكی چاك و پاك و، بەدڵ و دەروونێكی پڕ لەسۆزەوە..؟ ﴿فیضاعفه له اضعافا كثیرة﴾ هەتا خوایش چەند ئەوەندەی بداتەوە ﴿والله یقبض ویبسط﴾ خوا مەیلی خۆیەتی رزق و رۆزی بەندەكان كەم بكاتەوە، یان زۆرو فراوانی بكات ، واتە: لەبەخششدا رژدیی وچرووكی بۆ جیهاد مەكەن، چونكە كلیلی ماڵ و دارایی هەر لای خۆیەتی ﴿والیه ترجعون﴾ وسەرەنجام هەمووشتان هەر بۆلای دێنەوە، تەنها هەر لای ئەویش دادگایی دەكرێن.

**جوولەكە داوای (شا)یەك دەكەن، لەگەڵیا بچنە غەزا:**

﴿[٢٤٦] الم ترالی الملإ من بنی إسرائیل من بعد موسی﴾ ئەرێ نەتزانیوە چەند كەسێك لە پیاو ماقوڵانی (بەنی ئیسرائیل) لە پاش مووساو لەسەردەمی (دادود)دا ﴿إذ قالوا لنبی لهم ابعث لنا ملكا نقاتل فی سبیل الله﴾ بە پەیامبەرەكەی خۆیانیان گوت: (شا) رابەرو ئەمیرێكمان بۆ هەڵبژێرە، تا لەژێر فەرمانی ئەودا، نەخشە وپلانی جەنگ دارێژین و، لەرای خوادا جەنگ بكەین ﴿قال هل عسیتم إن كتب علیكم القتال الا تقاتلوا﴾ پەیامبەرەكە وتی: باشە! ئەگەر بڕیاری جەنگتان بۆدراو، لەوانە نیە جەنگ نەكەن و پەشیمان بنەوە؟ ﴿قالوا ومالنا الا نقاتل فی سبیل الله﴾ ئەوانیش وتیان: جا چۆن ئێمە لەپێناو دینی خوا خۆ دەبوێرین؟ ﴿وقد اخرجنا من دیارنا وابنائنا﴾ خۆ دەشبینی لەزێدی خۆمانیان وەدەرناوین، لە ئەولادو منداڵمان دورخراینەوە..؟ جا كە ئەوە حاڵمان بێ، ئێمە چۆن جیهاد ناكەین؟! ﴿فلما كتب علیهم القتال تولوا إلا قلیلا منهم﴾ جا كە فەرمانی جەنگیان بۆ دەرچوو! هەر كەمێكیان نەبێت روویان وەرگێڕاو، پەشیمان بوونەوەو رایانكرد ﴿والله علیم بالظالمین﴾ و خوا بەناهەقیكاران زاناو بەئاگایە كە جیهاد ناكەن ﴿[٢٤٧] وقال لهم نبیهم إن الله قد بعث لكم طالوت ملكا﴾ جا كەئەوان داوای سەركردەو ئەمیرێكی جەنگییان كرد پەیامبەرەكەیان پێیگوتن: دەسا دڵنیابن خوا بڕیاری داوە (تالووت) -كە سەربازێكەو لەبنەماڵەی پاشاكان نییە- پاشاو ئەمیرتان بێت، وەك خۆشتان داوای پاشاو فەرماندەیەكتان كرد ﴿قالو انی یكون له الملك علینا﴾ كەچی هەندێكیان وتیان: جاكوا ئەو شایانی ئەم پاشایەتیەیە لەسەر ئێمە؟! واتە: لەبنەماڵەی سەركردەو پاشاكان نیە ﴿ونحن احق بالملك منه﴾ ئێمە خۆمان لەو زۆر بە شیاوتر دەزانین بۆ سەركردایەتی وفەرماندەیی ﴿ولم یؤت سعة من المال﴾ جگە لەوەیش، ماڵ و سامانێكی وایشی پێنەدراوە، دیارە پاشاو فەرماندەش بەلای ئەوانەوە دەبێ سەروەتمەند بێ ﴿قال إن الله اصطفاه علیكم﴾ پەیامبەرەكە وتی: بێگومان خوا ئەو (تالووت)ەی بۆ هەڵبژاردوون و لەسەری كردوونە فەرماندە ﴿و زاده بسطة فی



أَلَمْ تَرَ إِلَى الْمَلَإِ مِن بَنِي إِسْرَائِيلَ مِن بَعْدِ مُوسَىٰ إِذْ قَالُوا
لِنَبِيٍّ لَّهُمُ ابْعَثْ لَنَا مَلِكًا نُّقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ قَالَ
هَلْ عَسَيْتُمْ إِن كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ أَلَّا تُقَاتِلُوا
قَالُوا وَمَا لَنَا أَلَّا نُقَاتِلَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَقَدْ أُخْرِجْنَا
مِن دِيَارِنَا وَأَبْنَائِنَا فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ الْقِتَالُ تَوَلَّوْا
إِلَّا قَلِيلًا مِّنْهُمْ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالظَّالِمِينَ ﴿٢٤٦﴾ وَقَالَ
لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ اللَّهَ قَدْ بَعَثَ لَكُمْ طَالُوتَ مَلِكًا
قَالُوا أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُ الْمُلْكُ عَلَيْنَا وَنَحْنُ أَحَقُّ بِالْمُلْكِ
مِنْهُ وَلَمْ يُؤْتَ سَعَةً مِّنَ الْمَالِ قَالَ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَاهُ
عَلَيْكُمْ وَزَادَهُ بَسْطَةً فِي الْعِلْمِ وَالْجِسْمِ وَاللَّهُ
يُؤْتِي مُلْكَهُ مَن يَشَاءُ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٤٧﴾
وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ آيَةَ مُلْكِهِ أَن يَأْتِيَكُمُ
التَّابُوتُ فِيهِ سَكِينَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَبَقِيَّةٌ مِّمَّا
تَرَكَ آلُ مُوسَىٰ وَآلُ هَارُونَ تَحْمِلُهُ الْمَلَائِكَةُ
إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٢٤٨﴾

العلم والجسم﴾ و زانست و زانیارییەکی زۆرو، قەڵافەتێکی بەهێزو، شان وشەوکەتێکی پتر لەئێوەی داوەتیٚ واتە: زۆر ئازاو خاوەن پلانی جەنگە.(ئیبن کەسیر) دەڵێ: دەبێ فەرماندە ئەم دووسیفەتەی تێدا بێت: یەکەم/ بەوکارە زاناو شارەزا بێت . دووەم/ لەش وقەوارەو جەستەیەکی رێکوپێك وداڕێژراو، بۆئەوەی خەڵك رێزی لێ بنێن و بەرگەی ناڕەحەتی وتەنگانە بگرێ ﴿والله یؤتی ملکه من یشاء﴾ خوا بیەوێ موڵك و پاشایەتی بە هەرکەس بدا دەیدا، ئیتر بەئارەزووی ئێوە نابێت ﴿والله واسع علیم﴾ بەخششی فراوان و بەر بلاوە، لە هەمووشتێك بەئاگایە، ئەزانێ کێ شیاوی بەخشینی موڵك و دەسەلاتە، تەفسیری (خاڵ)یش لەم شوێنەدا ئەڵێ: بۆیە خوا (طالوت)ی هەڵبژارد، چونکە: یەکەم/ بە سورشت ئامادەتر بوو بۆ پاشایی، کە ئەمە لەهەمووشت گرنگترە. دووەم/ زاناترو داناتر بوو بۆ هەڵسوڕاندنی کاروباری کۆمەڵ و گەل. سێیەم/ جوانترو بەسەرو سیماتر بوو. چوارەم/ یارمەتی خواشی لەگەڵ بوو.

خوای گەورە ئەم گشت هۆیانەی بۆ رێکخستبوو، بێ ئەوەی کەدەخلی خۆی تێدابێت ﴿[٢٤٨] وقال لهم نبیهم إن آیة ملکه أن یأتیکم التابوت﴾ و پەیامبەرەکەیان پێیگوتن: پیرۆزی وراستیی نیشانەو دروشمی پاشایەتی (تالووت) لەلایەن پەروەرگاریەوە، سندوق و " تابووتە" زەوتکراوەکەیە، بۆتان دێتەوە، ئەو سندوقەش کاتی خۆی (بەنی ئیسرائیل) تەوراتیان تێخستبوو وهەڵیان گرتبوو، بەلام (عەمالیقە)کان هاتن بەسەریاندا زاڵبوون و لێیان زەوتکردن ﴿فیه سکینة من ربکم﴾ دڵنیابوونی تێدایە ﴿وبقیة مما ترك آل موسى وآل هارون﴾ لەگەڵ هەندێ یادگارو کەلەپووری خانەوادەی موساو هاروون، وەك : داردەست و پێڵاوو کالاکەی مووساو مێزەرەکەی هاروون"ی برای، ئەمانە لەو تابووتەدان و دێنەوە دەستتان ﴿تحمله الملائکة﴾ فریشتە هەڵیدەگرن ودەیهێننەوە بۆتان﴿إن فی ذلك لآیة لکم إن کنتم مؤمنین﴾ بەراستیی لە گەڕانەوەی ئەوسەندوقەدا ، نیشانەو بەڵگەی گەورە هەیە بۆتان، بۆ شیاویی (تالووت) ئەگەر بەخواو بەرۆژی دوایی باوەڕتان هەیە. ﴿[٢٤٩] فلما فصل طالوت بالجنود﴾ جاکە تالووت لەشکرەکەی لەشاری (بیت المقدس) بردە دەرێ ﴿قال إن الله مبتلیکم بنهر﴾ پێیگوتن: بێگومان خوای گەورە دەیەوێ بەجۆبارێك تاقیتان بکاتەوە ﴿فمن شرب منه فلیس منی﴾ ئەوسا هەرکەسێك لێی بخواتەوە لەمن نیەو بەکەڵك نایەت لەم سوپایەدا بێت، ئەو جۆبارو چەمەش کەوتبووە نێوان (ئەردەن) و (فەلەستین)ـەوەو پێیدەڵێن: جۆباری (شەریعە) ﴿ومن لم یطعمه فإنه منی﴾ وهەرکەسیش هیچی لێنەخواتەوە سەر بەمنەو بەکەڵکی سەربازیی دێت ﴿إلا من اغترف غرفة بیده﴾ مەگەر کەسێك هەربە لامشت لێی هەڵگۆزێ ولێی بخواتەوە، ئەوە قەیناکات ﴿فشربوا منه إلا قلیلا منهم﴾ ئینجا لەگەڵ ئەورۆونکردنەوەیەدا هەموو لێیان خواردەوە کەمێکیان نەبێت ﴿فلما جاوزه هو والذین آمنوا معه﴾ ئینجا کە تالووت وئەوانەی باوەڕیان لەگەڵیا



فَلَمَّا فَصَلَ طَالُوتُ بِٱلۡجُنُودِ قَالَ إِنَّ ٱللَّهَ مُبۡتَلِيكُم
بِنَهَرٖ فَمَن شَرِبَ مِنۡهُ فَلَيۡسَ مِنِّي وَمَن لَّمۡ يَطۡعَمۡهُ فَإِنَّهُۥ
مِنِّيٓ إِلَّا مَنِ ٱغۡتَرَفَ غُرۡفَةَۢ بِيَدِهِۦۚ فَشَرِبُواْ مِنۡهُ إِلَّا قَلِيلٗا
مِّنۡهُمۡۚ فَلَمَّا جَاوَزَهُۥ هُوَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ قَالُواْ
لَا طَاقَةَ لَنَا ٱلۡيَوۡمَ بِجَالُوتَ وَجُنُودِهِۦۚ قَالَ ٱلَّذِينَ
يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُواْ ٱللَّهِ كَم مِّن فِئَةٖ قَلِيلَةٍ
غَلَبَتۡ فِئَةٗ كَثِيرَةَۢ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ٢٤٩
وَلَمَّا بَرَزُواْ لِجَالُوتَ وَجُنُودِهِۦ قَالُواْ رَبَّنَآ أَفۡرِغۡ
عَلَيۡنَا صَبۡرٗا وَثَبِّتۡ أَقۡدَامَنَا وَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ
ٱلۡكَٰفِرِينَ ٢٥٠ فَهَزَمُوهُم بِإِذۡنِ ٱللَّهِ وَقَتَلَ
دَاوُۥدُ جَالُوتَ وَءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلۡمُلۡكَ وَٱلۡحِكۡمَةَ
وَعَلَّمَهُۥ مِمَّا يَشَآءُۗ وَلَوۡلَا دَفۡعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعۡضَهُم
بِبَعۡضٖ لَّفَسَدَتِ ٱلۡأَرۡضُ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ ذُو
فَضۡلٍ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ٢٥١ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ
نَتۡلُوهَا عَلَيۡكَ بِٱلۡحَقِّۚ وَإِنَّكَ لَمِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ٢٥٢

هێنابووو لە چەمەکە پەڕینەوەو، لەتاقیکردنەوەکە دەرچوون (کەژمارەیان (٣١٣) کەسبوو، بەئەندازەی یارانی بەدەر) ﴿قالوا لا طاقة لنا اليوم بجالوت وجنوده﴾ وتیان: ئەمڕۆ لەبەر زۆری ئەوانەو کەمی ئێمە، لەوزەو توانامانـدا نیە بەرامبەر بەجالووت ولەشکرەکەی بوەستین وبجەنگێین ﴿قال الذين يظنون انهم ملاقوا الله﴾ ئەوانەیان یەقینیان بوو بەدیداری خوا دەگەن گوتیان: ﴿كم من فئة قليلة غلبت فئة كثيرة بإذن الله﴾ گەلێ جار بەفەرمانی خوا کۆمەڵێکی کەم بەسەر کۆمەڵێکی زۆردا سەرکەوتوون، واتە: زاڵبوون وسەرکەوتن بەژمارەی زۆرو کەم نیە، بەڵکو هەر بەئیرادەو فەرمانی خوایە ﴿والله مع الصابرين﴾ خوا هەمیشە لەگەڵ دەستەی بەئارام و خوڕا گرانەو ، هەردەم پشتگیرییانە ﴿[٢٥٠] ولما برزوا لجالوت وجنوده﴾ جا کە تالووت وسوپا کەمەکەی، تووشی جالووت وسوپا زۆروو مەشق دیدەکەی بوو ﴿قالوا ربنا افرغ علينا صبرا﴾ سوپاکەی (تالووت) نزایان کردو گوتیان: ئەی پەروەردگاری ئێمە! وابکە گشت کاتێ صەبرمان بەسەردا بڕێژە، بەتایبەتی لەم گۆڕەپانی جەنگەدا خۆڕاگربین ﴿وثبت اقدامنا﴾ پێمان لە گورەپانی جەنگدا بچەقێنەو سەقامگیربین، هەرگیز ترس نەچێتە دڵمانەوەو هەڵنەیێین ﴿وانصرنا على القوم الكافرين﴾ و بەسەر دەستەی بێ باوەڕانی وەکو جالووت ولەشکرەکەی سەرمان بخە.. بەڵێ پێویستە موسڵمانان هەموکاتێ بەتایبەتی لەگۆڕەپانی جەنگدا دڵیان هەرلای خوابێت، پەیتا پەیتا داوای کۆمەك ویارمەتی لێبکەن ﴿[٢٥١] فهزموهم بإذن الله﴾ ئینجا تالووت وسوپاکەی" بەفەرمانی خوا" جالووت وسوپاکەیان شکاند ﴿وقتل داود جالوت﴾ داوود کەسەربازێك بوو لەگەڵ سوپاکەی تالووت (جالووت)ی فەرماندەی لەشکرەکەی ئەوانی کوشت، ئیتر لەشکر شکاو، (تالووت)یش خەڵاتی داوودی کرد ﴿وآتاه الله الملك والحكمة﴾ لەوەودوایش خوا فەرمانڕەوایی و زانستی پێدا ﴿وعلمه مما يشاء﴾ و هەرچی خۆی ویستی فێری ئەوی کرد، دروستکردنی"جل وبەرگی جەنگیی، لەگەڵ ناووشۆرەتی باشداو کتێبی (زەبوور)یشی بۆناردو کردیە پێغەمبەر﷤ ﴿ولولا دفع الله الناس بعضهم ببعض﴾ ئەگەرخوا هەندێك لەوخەڵکە بێ باوەڕەی بەهەندێ لەو مەردمە باوەڕدارە لەناونەبردابا ﴿لفسدت الأرض﴾ ئێستا ئەم زەویە خراپ وویران ببوو، فەساد زەوی گرتبوویەوە ﴿ولكن الله ذوفضل على العالمين﴾ بەڵام خوا فەزڵو چاکەی لەسەرگشت جیهانیان هەیە، بەیناوبەین ستەمکاران بەدەستی خەڵکانی راست وخاوەن عەدالەت لەناو دەبات، وسیخورمەیەك لە باوەڕداران دەداو، وەخەبەردێن ولە بێ باوەڕیان رادەپەڕن وڕایان دەماڵن ﴿[٢٥٢] تلك آيات الله نتلوها عليك بالحق﴾ ئەمانە بۆمان باسکردی "هەر لەباسی هەزاران کەسەکەوە هەڵهاتن لەنیشتمانیان و، دەسەڵاتدان بە تالووت و.." گشت ئەمانە نیشانەکانی دەسەڵاتی خوان کە بەراست و رەوان بۆت دەخوێنینەوە.

ڕێنمایی ئایەتی (٢٥٠-٢٥١):

١- جیهادی شەرعیی دەبێ رابەرو فەرماندەیەکی شەرعیی هەبێ، پێویستە ئەو فەرماندەش، بەکاروباری جەنگ زاناو کارامەبێت، فامیدەو ژیر بێ، بەلاشەو جیسمانی بێ.

٢-تاقیکردنەوەو هەڵسەنگاندنی لەشکر، بۆ زانینی ئەندازەی ئامادەیی بۆ جەنگ و خۆڕاگریی لە کاتی تەنگانەدا پێویستە.

٣- جیهاد لە بەر لەناو بردنی فەسادو شەڕ فرۆشان فەرمانی پێکراوە.

٤- ژمارەی سوپاکەی تالووت (٣١٤) کەس بوو، وەك ئەو فەرمووده: ((إنكم على عدة أصحاب طالوت)) بە هاوەڵانی (بەدر)ی فەرموو ئێوەش هەر بەقەد هاوەڵەکانی (تالووت)ن، ئەوان (٣١٤) کەس بوون خوای گەورە سەری خستن بەسەر لەشکری کافراندا.

﴿وإنك لمن المرسلين﴾ و دڵنیابە (ئەی موحەممەد) ﷺ یەکێکی لەپەیامبەران، کەواتە پشت ئەستوربە لەسەر کاری خۆت. خاوەنی تەفسیری (مەراغیی) دەڵێت: ئەو چیرۆکانەی پێشەوە ئەم پەندانەیان تیا بەدی دەکری: یەکەم/ هەرگەلێك بەرەو تیاچوون ملی نا، دەبێ بیربکاتەوەو بەگورجی هەموویان بڕۆنە ژێر ئاڵای پیاوێکی دادگەرییانەوە، وەك نەوەکانی یەعقوب. دووەم/ پێویستە پیاو ماقووڵانی وڵات جەماوەرەکەیان بە خەبەر بکەنەوە. سێیەم/ کاتێ جاماوەرەکە سەر لێشێواو بوو، وادەزانن: بەڕێوەبەرانی وڵات دەبێ دەوڵەمەندو سەروەتمەند بن، بەڵام نە.. دەبێ کەسانێك بن شارەزای زانست و زانیاریی ئەو سەردەمە بن، با زۆر هەژارو بێ نەوایش بن. چوارەم/ ئەوکاتە سەرکەوتن بە دەست دێت کە سوپاکە گوێڕایەڵی تەواویان بۆ فەرماندەکەیان ببێ. پێنجەم/ گەلێ جار گەلانی بێ دەسەڵات و ژمارە کەم بەسەرژمارەیەکی زۆردا زاڵ ئەبێ، ئەگەر ئارامی ببێ و لەخوا بپارێتەوە. شەشەم/ جەنگ و بەگژاچوون بۆ ڕامالّینی تاوانباران، سوونەتێکی خواییە، هەندێ کاتیش کارێکی ناچارییە.

الجزء الثالث — سورة البقرة

تِلْكَ الرُّسُلُ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ مِّنْهُم مَّن كَلَّمَ اللَّهُ
وَرَفَعَ بَعْضَهُمْ دَرَجَاتٍ وَآتَيْنَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ الْبَيِّنَاتِ
وَأَيَّدْنَاهُ بِرُوحِ الْقُدُسِ وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ مَا اقْتَتَلَ الَّذِينَ
مِن بَعْدِهِم مِّن بَعْدِ مَا جَاءَتْهُمُ الْبَيِّنَاتُ وَلَٰكِنِ اخْتَلَفُوا
فَمِنْهُم مَّنْ آمَنَ وَمِنْهُم مَّن كَفَرَ وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ مَا اقْتَتَلُوا
وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَفْعَلُ مَا يُرِيدُ ﴿٢٥٣﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَنفِقُوا
مِمَّا رَزَقْنَاكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ يَوْمٌ لَّا بَيْعٌ فِيهِ وَلَا خُلَّةٌ وَلَا
شَفَاعَةٌ وَالْكَافِرُونَ هُمُ الظَّالِمُونَ ﴿٢٥٤﴾ اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ
الْحَيُّ الْقَيُّومُ لَا تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ لَّهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا
فِي الْأَرْضِ مَن ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِندَهُ إِلَّا بِإِذْنِهِ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ
أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِّنْ عِلْمِهِ إِلَّا بِمَا
شَاءَ وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَلَا يَئُودُهُ حِفْظُهُمَا
وَهُوَ الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ ﴿٢٥٥﴾ لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ الرُّشْدُ
مِنَ الْغَيِّ فَمَن يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللَّهِ فَقَدِ
اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ لَا انفِصَامَ لَهَا وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٥٦﴾

٤٢ — اللَّهُ وَلِيُّ

کۆتایی جزمی (٢)ی سوورەتی بەقەرە

(ولله الحمد والمنة)

*** *** ***

### هێندێ پێغەمبەر پلەی بەرزترە:

﴿[٢٥٣] تلك الرسل فضلنا بعضهم على بعض﴾ ئێمە بە هەموو ئەم پەیامبەرانە "کە تۆش یەکێکیانی" شان و شەوکەت و پلەی تایبەتیمانداوە، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێکیان لەهەندێکی تریان "لەپلەو پایەی پەیامبەریەتیدا بەرزترن، چونکە ئازارو بێزاریان لەوانی تر پتر دیتووە ﴿منهم من کلم الله﴾ بۆ نموونە: هەیانە یەکسەرە خوا خۆی قسەی لەگەڵ کردووە، وەك (مووسا) و(موحەممەد) سڵاویان لێبێت ، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ورفع بعضهم درجات﴾ و پلەوپایەی هەندێکیانیشی وەك (موحەممەد) ﷺ کەخوا خۆی لە بارەیەوە دفەرموێت: (وإنك لعلى خلق عظیم)- بردە سەر هەموویانەوە، هەر وەك پلەی هەندێ پێغەمبەری تریشی لە (ئولولعەزم)ـەکان ، لەچاو ئەوانیتردا سەرخست.. ﴿وآتینا عیسى ابن مریم البینات﴾ و بە (عیسای کوڕی مەریەم)یش چەندین بەڵگەو نیشانەی ڕوونمان بەخشی" وەك زیندوو کردنەوەی مردووان و، چاککردنەوەی کوێرانی زگماك"و هتد.. ﴿وایدناه بروح القدس﴾ وە بەجبریلی (روحول قودس) پشتگیریمان لێکرد، دیارە ئەمانەو ئەو چەند مۆجیزانەی ترە کە لەسوورەتی(ئالی عیمران) و (مائیدە)دا باسکراون، گشت مانای پلە بەرزی عیسان ﴿ولو شاء الله ما اقتتل الذین من بعدهم﴾ خۆ ئەگەر خوا ویستبای -ئەوانەی کە لە دوای ئەم گشت پەیامبەرانەوە هاتن-، باوەڕدار دەبوون و شەڕی یەکتریان نەدەکرد ﴿من بعد ما جاءتهم البینات﴾ بەتایبەتی پاش ئەو هەموو بەڵگەو نیشانانە بۆیان هات ، بەڵام دیارە خوا نەیویست لەو کارە بەزۆر ڕێیان لێبگری و باوەڕبێنن ، بۆیە

دەفەرموێ: ﴿ولكن اختلفوا﴾ بەڵام ئەوان لەناوخۆیاندا تێکچوون ودژایەتیی و نەیاریی یەکتریان کرد ﴿فمنهم من آمن ومنهم من كفر﴾ ئینجا هەندێکیان باوەڕیان هێناو، هەیشیانبوو بێ بڕواو خوانەناس مایەوە ﴿ولو شاء الله ما اقتتلوا﴾ ئەگەر خوا ویستبای بەر نەدەبوونە گیانی یەکتر و یەکتریان نەدەکوشت، چونکە هەموو شتێ هەر بەدەستی ئەوەو، ئەوخۆی ئەتوانێ بە پێی ویستی خۆی بیکات، وەك ئەفەرموێ: ﴿ولكن الله يفعل ما يريد﴾ بەڵام ئەوەی کە خوا خۆی دەیەوێ لە ڕووی حیکمەت و زانینەوە بیکا، دەیکا، ئیتر بەزۆر هیچ شتێك بەکەس ناکات. بەڵکو ئەیخاتە بەر ئەقڵ و ویژدانی خۆیی وسەربەستی دەکات ﴿[٢٥٤] يا أيهاالذين آمنوا أنفقوا مما رزقناكم﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! ببەخشن هەندێك لەو ماڵ و سامانەی پێمانداون ﴿من قبل ان يأتى يوم لا بيع فيه ولا خلة ولا شفاعة﴾ پێش لە هاتنی ڕۆژێك هیچ کڕین و فرۆشتنێکی تێدا نییە (تا بەماڵ خۆتان بکڕنەوە) هەروەك هیچ دۆستیی و تکاو شەفاعەتێك سوودی نابێ. ڕاڤەکەرانی قورئان دەڵێن: دۆستایەتی تەنها لە نێوان بێ بڕواکاندا سوودی نیەو بێ کەڵکە، تکاش هەر بۆ بێ بڕوایان نیە، ئەگینە-ئەگەر خوا خۆی بیەوێ و مۆڵەت بدات- بۆ موسڵمانان شەفاعەت هەیە، جا بۆ مەسەلەی شەفاعەتیش بگەڕێرەوە بۆ ئایەتی (٤٨)ی ئەم سوورەتە" لەوێ زیاتر باسی شەفاعەتکراوە. ﴿والكافرون هم الظالمون﴾ و هەرکافروو بێ باوەڕان ناهەقیکارو ستەمکارن، چونکە هەر ئەوانن بە تەواوی لە سنوور دەرچوون و لەخوا یاخی بوون، بۆیە هەرشتێکیش-لە دنیادا- بەخت بکەن لێیان وەرناگیرێ ، دەسا ئێوە بەسەرو بە ماڵ جیهادیان بکەن.

ڕێنمایی ئایەتی (٢٥٣-٢٥٤):

* پایەو پلەی هەندێ لە پەیامبەران-سڵاویان لە سەر بێت-لە هەندێکیان بەپێی جیهادو تێکۆشان و خۆڕاگرتن- گەورەترە. * (کەلام) سیفەتێکی بەرزی ئەزەلیی خوایە، هەروەکو خوای گەورە خۆی لە کێوی توور لەگەڵ مووساو، لە (مەلەکوت)ی بڵندیشا لەگەڵ موحەممەد ﷺ وتووێژی کرد. * بڕواو ئیمان، بێ بڕوایی و کوفر، هەریەك لەمانە بەستراوە بە ویستو خواستی خواوە ، ویستی هەر کەسێك ئیمان بێنێت، دڵی گوشاد دەکات، نەیشیویست، دڵی قوفڵ دەبێت. * ئیختیلاف و دەنگە دەنگ سەرچاوەی هەموو نەگبەتییەکەو، کارێکی زۆر دزێو وناپەسەندە. * ئینفاق و بەخشین لە ڕێی خوادا واجیب و پێویستە، هۆشیاری بۆ خۆسازدان بۆ ڕۆژی بەرێ، بە ئیمان و کارو کردەوەی چاك دەبێت.

### گەورەیی و مەزنیی (ئایەتەلکورسیی):

﴿[٢٥٥] الله لا إله إلا هو الحى القيوم﴾ (الله) کە بێ وێنەو بێ هاوتایەو خاوەنی هەموو سیفاتی کامڵە، جگە لەو هیچ پەرستراوێکی تری ڕاستەقینە نیە، هەر ئەوە هەمیشە زیندووی ڕاستە قینەو، ڕاگیرکاری بوونەوەرو" بەڕێوەبەری کاروباری دوروستکراوەکانی خۆیەتی و ڕاوەستاوە بەزاتی خۆیەوە ﴿لاتأخذه سنة ولا نوم﴾ نەخەوە نووچکە دای ئەگرێ و، نەخەو دەیباتەوە ﴿له مافى السموات ومافى الأرض﴾ هەرچی هەبێ لە ئاسمانەکان و لە زەوییدا هەرموڵکی ئەوە ﴿من ذا الذى يشفع عنده إلا بإذنه﴾ کێ بێت- لە ڕۆژی دواییدا- بتوانێ شەفاعەت بکات لای ئەو، هەتا ئەوخۆی مۆڵەتی نەدا؟" دیارە کە هەتا ئەوخۆی مۆڵەت نەدات ، هیچ کەسێك ناتوانێ تکا بکات، هاوبەشدانەرەکان پێیان وابوو کە: بتەکان دەتوانن شەفاعەتیان بۆ بکەن بۆیە ئەیانوت: (ما نعبدهم إلا ليقربونا إلى الله زلفى ..) ٣/٣٩. ﴿يعلم مابين أيديهم وما خلفهم﴾ ئەوەی ئێستا لەبەردەستیانایەو دیارە، ئەوەیش کە لەپاش سەریانەوەیەو نادیارە، ئەو پێی ئاگایە، واتە: کاروباری دونیاو قیامەتیان تەنها هەر ئەو ئەیزانێ" ﴿ولا يحيطون بشئ من علمه إلا بما

شاء﴾ هیچ کەسیش ناتوانێ بەپلەی زانینی خوادا بگا، مەگەر خوا خۆی بیەوێ، کە لەسەر زمانی پەیامبەران شتێکیان بۆ ڕوون بکاتەوەو ئاگاداریان بکا ﴿وسع کرسیه السموات والأرض﴾ کورسیی خوای گەورە تەواوی ئاسمانەکان و زەویی داگرتووە. (کورسیی) لای زمانەوانەکان "أهل اللغة" بە واتای: تەختی پاشایەتی هاتووە. بەڵام ئەو کورسییەی کە خوا بۆ خۆی قایەل دەبێو دەفەرموێ: (وسع کرسیه) مەبەست جێ پێی پەروەردگار خۆیەتی -جل جلالە-، وەك (ئیبن عەباس) ئەفەرموێت: (الکرسی: موضع القدمین، والعرش لا یقدر قدره إلا الله عزوجل) رواه الحاکم فی المستدرك، وقال إنه علی شرط الشیخین، وقد روی مرفوعا والصواب انه موقوف. بەڵێ هەر ئەمە کە ئیبن (عەباس) دەیڵێ، ڕاوو بۆچوونی زاناکانی سەلەفیشە، ئەم ریوایەتەیش کە دەڵێ: مەبەست بە (کورسیی) زانستو زانیاریی خوایەو، (تأویل)یشی دەکەن، ڕیوایەتێکی پارێزراو نییە، دیسانەوە ئەو ڕیوایەتەش کە دەڵێت: مەبەست بە (کورسیی) هەر عەرشە" (ئیبن کەسیر) دەڵێت- ئەوەیش ریوایەتێکی لاوازە. شایەنی باسە (عەرش)یش لە تەواوی دروستکراوەکانی خوا " بە کورسیشەوە، وەك (ئەبوزەر) دەیگێڕێتەوە" زۆر گەورەترە ،ئەبووزەڕ دەڵێ: (ان النبی ﷺ قال: ((ما السموات السبع والأرضون السبع عند الکرسی إلا کحلقة ملقاة فی أرض فلاة، وأن فضل العرش علی الکرسی کفضل الفلاة علی تلك الحلقة)) والحدیث لە طرق. وقد رواه أبو حاتم وابن حبان في صحیحه وأحمد في مسنده وغیرهم. واتە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر حەوت ئاسمانەکان و هەر حەوت زەوییەکە لەچاو (کورسیی) یدا، دەڵێیت ئەڵقەیەکەو خراوەتە زەوییەکی چۆڵ و کاکی بەکاکیی، ئەوسا عەرشیش لەچاو (کورسیی)یدا دەڵێیت ئەو زەوی یە کاکی بەکاکییەیە کە ئەو ئەڵقەیە تێ فرێدرابێ. وە ئێمەش هەر بەو جۆرە کە خوای گەورە باسی " عەرش و کورسیی " بۆ خۆی کردووە و سەلەف مانایان بۆ کردوین باوەڕمان پێیەتی، بێ هیچ (تەئویل) و(تعطیل)ێك. ﴿ولا یؤده حفظهما﴾ وە ڕاگرتن و پاراستنی ئاسمانەکان و زەویی بۆخوا گران و سەخت نییە ﴿وهو العلی العظیم﴾ و هەر ئەو بڵندو پایە بەرزو گەورەیە، لەدەسەڵات و تواناد‌ا هاوشانی نیە.

ڕێنمایی: ئەم ئایەتەی (٢٥٥):

١-پیرۆزترین و گەورەترینی ئایەتەکانی قورئان، ئایەتەلکورسییە، چونکە (١٨) جار ناوی پیرۆزی خوای تێدا هاتووە، لەنێوان ناوو ڕاناودا (ظاهر) و (مضمر)دا، پەنجاو شەش بێژەیە، (١٠) ڕستەیە، خۆ هەموو سوورەتەکەش هەر باس لە (ربووبیەت) و (ئولوهییەت) و (ئەسماء) و(سیفات)ی خوا ئەکا، پاش نوێژە فەرزەکان و، پێش خەوو، لە ناومالاً، بۆ تارنانی شەیاتینەکان خوێندنی سوننەتە و زۆر گرنگە. پێشەوا (ئەحمەد) یش ئەم فەرمودە لە فەزڵی ئەودا دەهێنێ: ((إن آیة الکرسی تعدل ربع القرآن، وإن الزلزلة، والکافرون ، والنصر، کل واحدة تعدل ربع القرآن، وإن الصمد تعدل ثلث القران) واتە: فەزڵ و گەورەیی ئایەتەلکورسی- بە تەنها خۆی- لە چواریەکی قورئان دەدات، ئەم سوورەتانەش: (زەلزەلە، کافیرون، نەصر) گەورەیی و خێری خوێندنی هەر یەکەیان هەروایە، بەڵام خوێندنی سوورەتی (صەمەد، واتە: ئیخلاص) خێری سێیەکی قورئانە. وە ئیمامی (نەسائی)یش ئەم فەرموودەیە باس ئەکات: ((من قرأ دبر کل صلاة مکتوبة آیة الکرسي لم یمنعه من دخول الجنة إلا أن یموت)). واتە: هەرکەسێك پاش نوێژە فەرزەکان ئایەتەلکورسی بخوێنێ، هەر کەمرد دەچێتە بەهەشتەوە.

**لەئیسلامدا خۆسەپان نیە:**

﴿[٢٥٦] لا إکراه فی الدین﴾ لەم دینی ئیسلامەدا داسەپاندنو ناچارکردن و زەبرو زەنگ نیە بۆدینداریی و وەرگرتنی ئایینی ئیسلام ، بەڵێ حوکمی ئەم ئایەتە تەنها خاوەن کتێب و خاوەن نامەکان ئەگرێتەوەو، مەنسوخ و

سڕاوەیش نییە، واتە: هەر جوولەکە وگاور سەر ناخرێتە سەریان بۆ ئیسلامبوون. ﴿قد تبين الرشد من الغى﴾ چونکە بێگومانە کەرێگای چاك وراست لە ڕێگای ناڕاست و کوفرو توولە ڕێگاکان لێك جیاکراوەتەوە و ئاشکراو نمایانە، جا لەبەر ئەوە نایەوێ زۆر لە هیچ کەسێك بکرێت بۆ ئیسلامبوون و هەر کەسەش بەمەیلی خۆیەتی ﴿فمن یکفر بالطاغوت﴾ ئینجا هەرکەسێك باوەڕی بە "تاغوت" نەبێت، دیارە تاغوت ئەو کەسەیە کە لە سنووری خوا دەرچێ و، بەرنامە چەوتەکان قبوولْ کا، جا هەرکەس خۆی لەو جۆرە شتانە دوورگرت ﴿ویؤمن بالله﴾ و باوەڕی بەخوا هێنا ﴿فقد استمسك بالعروة الوثقى﴾ ئەوە بێگومانە دەستی بە هەنگڵو بەهۆکارێکی پتەوو قایمەوە گرتووە ﴿لا انفصام لها﴾ کە هەرگیز هەڵناوەشێت و پسان وپچڕانیشی بۆنییە ﴿والله سمیع علیم﴾ وە خوای گەورەیش ژنەواو زانایە. زاناکان دەڵێن: (مەجوس) و (صوببی)یەکانیش، لەمەدا حوکمی جوولوکەو گاوریان هەیە، واتە: ئەمانیش هیچ جۆرە زۆرێکیان لێناکرێ بۆ وەرگرتنی دینی ئیسلام، بەڵکو هەر لەسەردینی خۆیان" ئەگەرپێیان خۆش بوو" دەمێننەوەو، سەرانەیان لێ ئەسەنرێ، بەڵام خەڵکانی تری بتپەرست و هاوەبەشدانەرو هەرجۆرە بێ دینێکی تر لەو بابەتە " هەتا ئەو ڕۆژە باوەڕ دێنن" دەبێ جەنگیان لەگەڵ بکرێ ئەگەر توانراو بەرژەوەندی تێدابوو. هەموو یاساو دەستورێکی ئیسلامی پیرۆز راست وهەقە، ئیتر بێجگە لەو ، گشت دەستورو بەرنامەیەکی تر ناراست وگومراییە. دەبێ پێش ئیمان و باوەرهێنان بەخوای گەورە، دەبێ بەتەواویی لەگشت تاغووتەکانەوە دوور بکەوی ، خۆدیارە واتای (لا اله إلا الله) یش بۆیەکەمجار نەفیی و لادانی هەموو دەسەڵاتدارە ملهوورەکان وتاغوتەکانی دنیایەو، پاشانیش تەسلیم بوونو باوەرهێنانە بەخوای تاكوتەنیا. شیاوی باسیشە لەسەردەمی جاهیلیەتدا هەر ئەو بتەی وا دەیان پەرست پێیان دەگووت: (طاغیە)، بۆپشتگیری ئەم قسەیە ئەم فەرموودە هاتووە: ((کانوا یهلون لمناة الطاغیة)).

الجزء الثالث — سورة البقرة

ٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَوۡلِيَآؤُهُمُ ٱلطَّٰغُوتُ يُخۡرِجُونَهُم مِّنَ ٱلنُّورِ إِلَى ٱلظُّلُمَٰتِۗ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٥٧﴾ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِي حَآجَّ إِبۡرَٰهِـۧمَ فِي رَبِّهِۦٓ أَنۡ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلۡمُلۡكَ إِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِـۧمُ رَبِّيَ ٱلَّذِي يُحۡيِۦ وَيُمِيتُ قَالَ أَنَا۠ أُحۡيِۦ وَأُمِيتُۖ قَالَ إِبۡرَٰهِـۧمُ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَأۡتِي بِٱلشَّمۡسِ مِنَ ٱلۡمَشۡرِقِ فَأۡتِ بِهَا مِنَ ٱلۡمَغۡرِبِ فَبُهِتَ ٱلَّذِي كَفَرَۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٥٨﴾ أَوۡ كَٱلَّذِي مَرَّ عَلَىٰ قَرۡيَةٖ وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا قَالَ أَنَّىٰ يُحۡيِۦ هَٰذِهِ ٱللَّهُ بَعۡدَ مَوۡتِهَاۖ فَأَمَاتَهُ ٱللَّهُ مِاْئَةَ عَامٖ ثُمَّ بَعَثَهُۥۖ قَالَ كَمۡ لَبِثۡتَۖ قَالَ لَبِثۡتُ يَوۡمًا أَوۡ بَعۡضَ يَوۡمٖۖ قَالَ بَل لَّبِثۡتَ مِاْئَةَ عَامٖ فَٱنظُرۡ إِلَىٰ طَعَامِكَ وَشَرَابِكَ لَمۡ يَتَسَنَّهۡۖ وَٱنظُرۡ إِلَىٰ حِمَارِكَ وَلِنَجۡعَلَكَ ءَايَةٗ لِّلنَّاسِۖ وَٱنظُرۡ إِلَى ٱلۡعِظَامِ كَيۡفَ نُنشِزُهَا ثُمَّ نَكۡسُوهَا لَحۡمٗاۚ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥ قَالَ أَعۡلَمُ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿٢٥٩﴾

٤٣

**خوا یاری ئیماندارانە :**

﴿[257] الله ولی الذین آمنوا﴾ هەر خوایە یارو یاوەری ئەو کەسانە باوەڕیان هێناوە ﴿یخرجهم من الظلمات إلى النور﴾ چونکە لە هەموو ڕێبازە چەوت وتاریکستانەکانی کوفرەوە دەریاندێنێ و بەرەو نوورو ڕۆشنایی ئیسلامیان دەبا ﴿والذین کفروا اولیاؤهم الطاغوت﴾ ئەوانەش کە کافرو بێ باوەڕن، یارو یاوەریان هەر تاغوت وشەیتانە لەجنیی و، لەئادەمیی ﴿یخرجونهم من النور إلى الظلمات﴾ لە ڕێبازی نوورو رووناکی دەریان دەپەرێنن و بەرەو ڕێبازە تاریکستانەکان دەیانبەن ﴿اولئك اصحاب النار هم فیها خالدون﴾ ئەمانە دەبنە یارویاوەری ئاگری دۆزەخ و، بە هەتاهەتاییش تێیدا ئەمێننەوە.

**جوابە جەنگێی نەمروود لەگەڵ ئیبراهیم ؑ:**

﴿٢٥٨ الم تر إلى الذى حاج إبراهيم فى ربه﴾ ئایا تۆ دیمەنی ئەو کەسەت نەدیبوو کەچۆن لەگەڵ ئیبراهیمدا "سەبارەت بە پەروەردگاری" دەمەقاڵێ و ململانێی دەکردو وای دەزانی هەرخۆی خوایە؟! ﴿ان آتاه الملك﴾ لەبەرئەوە کە خوا پاشایەتی ودەسەڵاتی پێدابوو، ئەوی کەخۆی بەخوا زانی بە عینادییەوە لێی پرسی و گوتی: ئەرێ تۆ پەروەردگارت کێ یە؟ ﴿إذ قال إبراهيم ربى الذى يحيى ويميت﴾ ئیبراهیمیش لەوەڵامدا گوتی: پەروەردگاری من هەر ئەو زاتەیە کە ژیان دەبەخشێت و، دەشمرێنێ، واتە: ژیان ومردن هەر بەدەستیی ئەوە ﴿قال انا أحي واميت﴾ کەچی ئەویش وتی: خۆ منیش کەسانێ دەژێنم و، کەسانێکیش دەمرێنم ئارەزووم لەهەرکەسێك بوو ئەوا ئەیکوژم ودەیمرێنم، وەیان چاوپۆشی لێ ئەکەم و دەیژێنم، دیارە ئەم وەڵامە هەر لەرووی عینادییەوە بوو، ئەگینا ئەوە وەڵام نەبوو. جاکە ئیبراهیم زانی وەڵامەکەی ناراستە، بەڵگەیەکی تری هێنایەوە بۆچەسپاندنی دەسەڵاتی خواو دەمکوت کردنی ئەو، بۆیە دەفەرموێ: ﴿قال إبراهيم فإن الله يأتى بالشمس من المشرق﴾ گوتی: دەی باشە خوا لەخۆرهەڵاتەوە خۆر دێنێ ﴿فأت بها من المغرب﴾ دەسا تۆیش کە داوای خوایەتی ئەکەیت لە خۆرئاواوە بیهێنە، واتە: یاسای بوونەوەر بگۆڕە ئەگەر تۆیش خوایت ﴿فبهت الذى كفر﴾ ئەوسا ئیتر ئەوستەمکارو بێ باوەڕەیە حەپەساو نقەی لێبڕاو وەڵامی نەماو بوو بەقسەی خۆیەوەو پەکیکەوت ﴿والله لا يهدى القوم الظالمين﴾ بێگومانە کە خوا هۆزو گەلی ستەمکاران ڕێنمایی ناکات، واتە: بەڵگە ونیشانەکانی خۆیانیانی فێر ناکات، هەتا بتوانن سەر لەهەقەوە دەرکەن، بۆزیاتر روونبونەوەی شێوەی شەڕە قسەو مشت ومڕ، سەیری (مونازەرە)کەی ئیبراهیم بکە لەئایەتی (٧٤)ی سوورەتی (ئەنعام)، لەگەڵ باوکیی وهۆزەکەیدا.

**ڕێنمایی ئایەتی (٢٥٨):**

١-نیعمەت و بەخششەکانی خوا لەلایەن خەڵکانی خوانەناس وکافرەوە، هەمیشە نکوولی و ئینکاری دەکرێن.

٢- یارمەتی و هاوکاری خوا تەنها بۆ دۆستانی خۆی دەبێ.

٣- هەرکات مرۆڤ چووە ناو ستەمەوە وکردیە کاری ڕۆژانەی، لە هیدایەتی خوا بێ بەش دەبێ.

٤- قسەو مشت ومڕ (المجادلة والمناظرة) لەمەڕ رونکردنەوەو چەسپاندنی بوونی خواو، راستیی دینی ئیسلامەوە دروست ورەوایە، پێدەچێ ئەو دەسەڵاتدارە (نەمروود)ی پاشای (بابل)یەکان بووبێ..

**سەرگوزەشتەی عوزەیر:**

﴿٢٥٩ أو كالذى مر على قرية وهى خاوية على عروشها﴾ یان دەنگوباسی ئەو کەسەت بیستووە کەبەقەراخ ئاواییەکی وێراندا (بيت المقدس) رابردوو دیتی، کە دارو بەردی هەموو بەسەریەکا کەوتووەو چۆڵ و وێرانەیەو دیوارەکانیشی بە میچەکەیەوە تەپیوە؟ ﴿قال انى يحيى هذه الله بعد موتها﴾ ئەوسا بەسەرسوڕمانێکەوە "لە بەرخۆیەوە" وتی: ئاخۆ خوا دوای وێرانبوونی ئەم گوندەو، مردنی خەڵکەکەی چۆن دەتوانێ ئەمە زیندوو ئاوەدان بکاتەوە؟ ﴿فأماته الله مائة عام ثم بعثه﴾ ئینجا خوا بۆماوەی سەد ساڵ مراندیی وبێ گیان کەوت، پاشان زیندووی کردەوە، تا بەچاو دەسەڵاتی ئەو (خوا)یە ببینێ ﴿قال كم لبثت﴾ خوا لەسەر زاری فریشتە لێیپرسی و فەرمووی: ئەرێ تۆ چەندەت پێچووە بە مردوویی؟ ﴿قال لبثت يوما أو بعض يوم﴾ لەوەڵامدا وتی: وا ئەزانم ڕۆژێك یا کەمتریش لە ڕۆژێك ماومەتەوە، زاناکان دەڵێن: ئەو ڕۆژە کەمردو بێ گیان کەوت کاتی چێشتەنگاو بوو، جاکاتێکیش زیندووی کردەوەو هەڵیساند کاتی خۆرئاوا بوو، بۆیە ئەویش ئەو وەڵامەی دایەوە ﴿قال بل لبثت مائة

عام﴾ خوا فەرمووی: نەخێر، بەڵکو سەد ساڵت پێچووە ﴿فانظر إلى طعامك وشرابك لم يتسنه﴾ ئەوسا لەگەڵ ئەوەیشدا تەماشایەکی خواردمەنی و خواردنەوەکەشت بکە، دەبینی تائێستاش تام و ڕەنگیان نەگۆڕاوەو فاسید نەبوون. ﴿وانظر إلى حمارك﴾ بشنوارە بۆ گوێدرێژەکەت چۆن ئێسکو پروسکی رزیووەو، چۆنیش هەر ئێستا لەپێش چاوخۆتەوە زیندووی دەکەینەوە؟ ﴿ولنجعلك آية للناس﴾ بۆ ئەوە ئەم مەسەلەی بەسەرهات و زیندووبوونەوەیەت بکەینە موعجیزەو پەندێك بۆخەڵك، هەتا دڵنیابن لە مەسەلەی زیندووبوونەوە ﴿وانظر إلى العظام كيف ننشزها﴾ سەرنجی ئەم ئێسقانانەش بدەو بزانە چۆن ئەیانبزوێنین وپێکیان دەلکێنینەوە، دوای ئەو ماوەزۆرەیە ﴿ثم نكسوها لحما﴾ لەپاشان بە گۆشت دایان دەپۆشین هەروەك یەکەمجاری لێ ئەکەینەوە ﴿فلما تبين له قال اعلم ان الله على كل شئ قدير﴾ ئینجا کاتێ ئەو دەسەڵاتەی بۆدەرکەوت و بۆی روون بوویەوە، وتی: وا ئێستا چاك ئەزانم و بەچاویش دیتم کە بەڕاستیی خوا بەسەر هەمووشتێکدا دەسەڵاتی هەیەو، دەتوانێ هەموو کارێ بکا.

سورة البقرة — الجزء الثالث

وإذ قال إبراهيم رب أرني كيف تحي الموتى قال أولم تؤمن قال بلى ولكن ليطمئن قلبي قال فخذ أربعة من الطير فصرهن إليك ثم اجعل على كل جبل منهن جزءا ثم ادعهن يأتينك سعيا واعلم أن الله عزيز حكيم ﴿٢٦٠﴾ مثل الذين ينفقون أموالهم في سبيل الله كمثل حبة أنبتت سبع سنابل في كل سنبلة مائة حبة والله يضاعف لمن يشاء والله واسع عليم ﴿٢٦١﴾ الذين ينفقون أموالهم في سبيل الله ثم لا يتبعون ما أنفقوا منا ولا أذى لهم أجرهم عند ربهم ولا خوف عليهم ولا هم يحزنون ﴿٢٦٢﴾ ۞ قول معروف ومغفرة خير من صدقة يتبعها أذى والله غني حليم ﴿٢٦٣﴾ يا أيها الذين آمنوا لا تبطلوا صدقاتكم بالمن والأذى كالذي ينفق ماله رئاء الناس ولا يؤمن بالله واليوم الآخر فمثله كمثل صفوان عليه تراب فأصابه وابل فتركه صلدا لا يقدرون على شيء مما كسبوا والله لا يهدي القوم الكافرين ﴿٢٦٤﴾

ومثل الذين — ٤٤

**سەرنجێك:** لەبەر ئەوەی کە قورئان ناوی ئەو کەسەی دیاری نەکردووە بەلای ئاواییەکەدا تێپەڕیی، ئێمەیش ناوەکەیمان دیاری نەکرد، چونکە زانایان لە بارەی دیاری کردنیەوە کێشەو ناکۆکی یان هەیە، گرنگیش هەر ئەمەیە بزانرێ کە خوایەك دەسەڵاتی زیندووکردنەوەی کەسێکی ببێ دوای مراندنی سەد ساڵ، دیارە کە هەر ئەو خوایەش دەسەڵات و توانای هەیە "دوای هەزاران هەزار ساڵ، یان ملیۆن ملیۆن ساڵ گیان بگێڕێتەوە بۆلاشە رزیوەکان، ئەم داستانەیە دەرگای پرسیارو وەلام بۆ دۆزینەوەی ڕاستییەکان دەکاتەوە، هاوکات لەگەڵ ڕێخۆشکردن بۆ داواکردنی بەڵگەو نیشانە بۆ کارە ئاڵۆزەکانی لای مرۆڤ.

**ئیبراهیم: خوایە! چۆن مردوان زیندوو دەکەیتەوە؟**

﴿[٢٦٠] وإذ قال إبراهيم ربى ارنى كيف تحيى الموتى﴾ وەبیر بێنەو باسی ئەمە بکە کە ئیبراهیم بۆ ئەوەی لە پلەی "علم اليقين وە بگاتە پلەی "عين اليقين" وتی: ئەی پەروەردگاری من! نیشانم دە- با بەچاوی سەر ببینم- کە تۆچۆن مردووان زیندوو ئەکەیتەوە؟ ﴿قال او لم تؤمن﴾ خوا فەرمووی: مە گەر تۆ هێشتا بڕوات، بەزیندوو بوونەوە نییە؟! ﴿قال بلى ولكن ليطمئن قلبى﴾ ئیبراهیم وتی: بەڵی چاك باوەڕم هەیە، کە تۆ دەتوانی مردووان زیندوو بکەیتەوە، بەلام حەز دەکەم بە چاوبیبینم تا بەتەواوی دڵنیابم هەر لەمەیشەوە بوو پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((نحن أحق بالشك من إبراهيم إذ قال: رب أرنى كيف تحيى الموتى، قال أو لم تؤمن؟ قال: بلى، ولكن ليطمئن قلبى)) فتح البارى: ٨/٤٩. ﴿قال فخذ اربعة من الطير﴾ خوا فەرمووی: دەسا چوار پەلەوەر بگرە وجوان سەرنجیان بدە، ئەوسا هەرچواریش سەر بڕە، ﴿فصرهن إليك﴾ ئینجا پەل پەلیان کەو خوێن وگۆشتەکەیان تێکەڵ بکەو بیانکە چوار کوت

﴿ثم اجعل على كل جبل منهن جزءا﴾ پاشان هەر کوتێکیان لەسەر لوتکەی کێوێك دانێ ﴿ثم ادعهن يأتينك سعيا﴾ ئەوجا بانگیان بکە و" بە فەرمانی خوا بەپەلە" زیندوو دەبنەوەو دێنە لات وهەر پارچەی لەگەڵ پارچەکەی خۆیدا یەك دەگرێتەوە ﴿واعلم ان الله عزيز حكيم﴾ بزانە و بێگومانبە کە خوا چەندە دەستەڵاتدارە، کاردروستە "بییەوێ هەرئیشێ بکات ئەیکات و ، پریشە لە حیکمەت".

رێنمایی ئایەتی (٢٦٠):

١- مرۆڤ بە سروشت حەزی لە زانینەو هەر لە هەوڵدایە بۆی، لە هەر شتێ تێنەگا بۆی دەکۆشێ تێبگاو بیزانێ.

٢- خۆشەویستی خوا بۆ ئیبراهیم بێ سنوورە، بۆیە وەڵامی دایەوە و نیشانەشی خستە پێش چاوی تا پتر دڵنیابێ.

٣- چەسپاندنی ژیانێکی دووەم -پاش مردن- بۆ پاداش و تۆڵە.

٤- زیاد بوونی ئیمان و باوەڕ بە تێڕوانین وبیرکردنەوە لە نیشانەکانی خوای گەورە.

تێبینی: ئێمەش لەم کورتە تەفسیرەدا ناوی پەلەوەرەکانمان -وەك هەندێ ریوایەت دیارییان دەکات- دیاری نەکرد چین؟ چونکە قورئانیش ناوی دیاریی نەکردوون، بێ لەوەیش ئەوەی کە لەم جێگایەدا گرنگ بێت هەرئەمەیە کە: زیندووکردنەوەی مردووان بۆخوا، کارێکی زۆرئاسانە، تەنها فەرمانێکی خوایی بەسە.

**ئەوانە لەراهی خوا ماڵ بەخت دەکەن:**

(قورتوبی) دەڵێ: لە رووداوەکەی (تەبووك)دا (عوسمانی کوڕی عەففان) -ڕەزای خوای لێبێ- هەزار وشتر- لەگەڵ هەموو پێویستییەکدا- و هەزار دینار زێڕیشی لەبەردەم پەیامبەر ﷺ دانا، ئینجا پەیامبەر ﷺ دەستی تێ ئەخست و ئەیفەرموو: ئیتر دوای ئیمڕۆ عوسمان هەرچی بکات قەیناکات. لەولایشەوە (عبدالرحمن)ی کوڕی (عەوف) هەشت هەزار دەرهەمی هێناو وتی: ئەی پەیامبەری خوا! چوار هەزاریشم بۆ منداڵەکانم داناوە، وا ئەو چوار هەزارەیشم بەقەرز دا بە خودا، پەپامبەر ﷺ فەرمووی: خوا بەرەکەت وپیت بخاتە هەردووکیانەوە. جابۆ ئەوە خوا فەرمووی: ﴿[٢٦١] مثل الذين ينفقون أموالهم في سبيل الله كمثل حبة انبتت سبع سنابل﴾ نموونەی ئەو کەسانەی کە دارایی خۆیان لە رێگەی خوادا دەبەخشن، هەر وەکو دانە تۆمێکە کەحەوت گوڵ دەردەکا ﴿في كل سنبلة مائة حبة﴾ و هەر گوڵەی سەد دانەی تێدا بێ " کەوابوو تەنها دانە تۆمێك (٧٠٠) دەنکی پێوە دەبێ، واتە: پاداشتی گشت خێرو چاکەیەك بە لای خواوە یەك بەدە، تا حەوت سەدە ﴿والله يضاعف لمن يشاء﴾ و هێمان بۆ هەرکەسیش خوا خۆی بیەوێ چەند بەرامبەر پاداش دەدا ﴿والله واسع عليم﴾ چونکە خوا بەخششی یەکجار فراوانە، زۆر ئاگاو زانایە" ئەزانێ هەرکەس چەندە هەڵدەگرێ".

رێنمایی ئەم ئایەتی (٢٦١):

١- فەزیلەتی بەخشین لە رێی جیهادا، ئینفاق و سەدەقە بۆ جیهاد لە هەموو شتێ گەورەترە، سەدەقەو ئەنجامە باشەکانی. ﴿[٢٦٢] الذين ينفقون أموالهم في سبيل الله﴾ ئەو کەسانەی کە سامانی خۆیان لە پێناوی خوادا دەبەخشن ﴿ثم لا يتبعون ما انفقوا منا ولا اذى﴾ پاشانیش هیچ جۆرە منەتێ ناکەن و بەچاویاندا نایدەنەوەو دڵی کەس ناشکێنن ﴿لهم اجرهم عند ربهم﴾ پاداشیان لای پەروەردگاریان بەرچاو گیراوە ﴿ولا خوف عليهم﴾ نەهیچ ترسێکیان بۆ ئەبێ لە رۆژی قیامەتداو ﴿ولا هم يحزنون﴾ نە خەفەتبارو زویریش ئەبن بۆ دنیایان. ﴿[٢٦٣] قول معروف﴾ قسەو گوفتارێکی خۆش و شیرین لە رووی نیازمەندانا، ﴿ومغفرة﴾ چاوپۆشی و لێبوردن لە هەڵەی داواکارێك ﴿خير من

صدقه يتبعها اذى﴾ باشترە لە بەخشینێ کە عەزیەت ودڵ ئێشانی بە دوادا بێ بەرامبەر خێرپێکراوێك ﴿والله غنى حليم﴾ خوایش لە بەخشینی ئێوە بە تایبەت (بەومنەتەوە) زۆر بێ نیازو، زۆریش هێمنەو، خۆگرو لەسەر خۆیە، دەتۆرێ و، چاوپۆشی دەکا.

رێنمایی ئایەتی (٢٦٢-٢٦٣):

١- منەتنان بەسەر خەڵکدا بەهۆی خێرو سەدەقەوە کارێکی حەرامە.

٢- هەرکات بەشی هەژاران نەبوو بدرێ، با قسەی خۆشیان لەگەڵ بکرێ، خۆ ئەگەر خێرخوازەکە تووڕەبوو و قسەی خراپی کرد، تۆ وریابە تووڕە مەبەو، لێی ببوورە، دیارە کە قسەیەکی خۆش لەو سەدەقەیە گەلێ باشترە کە منەت و ئازاری بەدوادا بێ، بۆیە ئەفەرموێ: (الكلمة الطيبة صدقة)) موسليم/٢٦٢٦/ باب/٤٤١) واتە: ئەر هیچ نەبوو بدرێتە داواکارەکە، خۆ قسەیەکی خۆش خێرو سەدەقەیە. یان دەفەرموێ: ((.. ولو أن تلقى أخاك بوجه طليق)) ئەر بە ڕوویەکی گەشەوە پێشوازی براکەت بکەیت- لەو حاڵەتەدا نییە بیدەیتێ- کارێکی باش و پەسەندەو بەکەمی مەزانە یا دەفەرموێ: ((لايدخل الجنة مدمن الخمر ، ولا عاق لوالديه ولا منان)) سێ کەس ناچنە بەهەشتەوە: کەسێ هەمیشە عارەق دەخواتەوە، کەسێ ئازاری دایك وبابی دەدا، کەسێکیش شت ببەخشێ و بیداتەوە بە ڕوویدا.

**ماڵ ببەخشن و مەیدەنەوە بە چاویاندا:**

﴿[٢٦٤] يأيها الذين آمنوا لا تبطلوا صدقاتكم بالمن والأذى﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! پاداشی سەدەقەو بەخششەکانتان بە هۆی منەتنان و ئازارگەیاندنەوە بەفیڕۆ مەدەن و باتڵ مەکەنەوە ﴿كالذى ينفق ماله رئاء الناس ولا يؤمن بالله واليوم الآخر﴾ وەکو کەسێك مەکەن کە بەڕوو پامایی وڕیپاکاریی ماڵی خۆی دەبەخشێت وئیمان و بڕواش بە خواو بەڕۆژی دوایی نییە، بۆیە هەردەم لەکاتی بەخشیندا ئازاری دڵی مەردم دەدات. ﴿فمثله كمثل صفوان عليه تراب﴾ ئەوکارەیان لەوە دەکا کەتاشە بەردێکی زۆر ساف و لووس هەندێ گڵی بە سەرەوە بێت و تۆمیشی لەسەر چێندرابێ ﴿فأصابه وابل فتركه صلدا﴾ بارانێکی لێزمەو دڵۆپ گەورەی لێی بباری و هیچ شتێکی بەسەرەوە نەیەڵێت و تاشە بەردەکە بەڕەق و تەقی بمێنێ" کردەوەی مرۆڤی ریابازیش هەر بەو شێوەیە، هەموو خێروبێرێکی بەبا ئەچێ و بەحەوادا ئەڕوا،"وەکو دەفەرموێ: ﴿لا يقدرون على شئ مما كسبوا﴾ هیچ بەهرەیەکیان لەو بەخشینە دەست ناکەوێ " نە لە دونیادا، نەلە قیامەتدا، چونکە لەبەر ڕەزامەندی خوا نەبووە" ﴿والله لا يهدى القوم الكافرين﴾ بێگومانبێ خوای گەورە هەرگیز هۆزو گەلی بێ باوەڕان ڕێنمایی ناکات بۆ شتێك خێریانی تێدا بێت" چونکە تەنها ئیمان و باوەڕە کەمرۆڤ بۆ خێرو بێری هەردووجیهان تێ دەگەیەنێ" ئەوان باوەڕیان نییە، خواش ڕێنماییان ناکات.

رێنمایی ئایەتی (٢٦٤):

١- منەتنان و ئازار گەیاندن بە خەڵك لە سەدەقەو بەخشیندا قەدەغەیە.

٢- منەتنەر ، ئازاردەر، ڕیا چی، سەدەقەکانیان بێهودە وباتڵە.

٣- ڕیا حەرامەو بەشێکە لە شیرك.

﴿[٢٦٥] ومثل الذين ينفقون أموالهم ابتغاء مرضاة الله وتثبيتا من انفسهم﴾ نموونەی ئەوانەش کە داراییان بۆ بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوا دەبەخشن و، دڵ و دەروونیشیان لەسەر پاداشی خوا سەقامگیرە، لەولایشەوە بەو بەخشینە " دڵ ودەرونیان لە ڕژدیی و چرووکی پاك دەکەنەوە" ﴿كمثل جنة بربوة أصابها وابل﴾ گەشەکردن و

زیادبوونی خێرەکەیان، هەر وەکو باخێکە بە تەپۆڵکەیەکی بەرزەوە بێ و، بارانێکی دڵۆپ گەورە لێی بدا ﴿فآتت اکلها ضعفین﴾ ئینجا باخەکەیان- لەچاو باخی تردا- دوو بەرامبەر بەروو بوو بدات ﴿فإن لم یصبها وابل فطل﴾ خۆ ئەگەر بارانی لێزمەو دڵۆپە گەورەش لێینەدا، نمە بارانێکی وردو سووك و شەونم تێراوی کا، جا مرۆڤی خێرخوازیش کارو کردەوەی هەمیشە لە برەودایەو، قەت بە فیرۆ ناچێ و، لای خواش قبوڵە ﴿والله بما تعملون بصیر﴾ خوای گەورەیش سەبارەت بەهەر کارێ ئێوە دەیکەن (بە ریابێ، یانا) بینایەو دەیبینێ و بەپێی ئەوە حیسابتان دەکا.

## کێ حەز دەکا خێرو خێراتی ببێتە قەرەقوو؟:

ورقة المصحف:



وَمَثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمُ ٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِ ٱللَّهِ
وَتَثْبِيتًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ كَمَثَلِ جَنَّةٍۭ بِرَبْوَةٍ أَصَابَهَا وَابِلٌ
فَـَٔاتَتْ أُكُلَهَا ضِعْفَيْنِ فَإِن لَّمْ يُصِبْهَا وَابِلٌ فَطَلٌّ
وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢٦٥﴾ أَيَوَدُّ أَحَدُكُمْ أَن تَكُونَ
لَهُۥ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَابٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ لَهُۥ
فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ وَأَصَابَهُ ٱلْكِبَرُ وَلَهُۥ ذُرِّيَّةٌ ضُعَفَآءُ
فَأَصَابَهَآ إِعْصَارٌ فِيهِ نَارٌ فَٱحْتَرَقَتْ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ
لَكُمُ ٱلْـَٔايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴿٢٦٦﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُوٓا۟ أَنفِقُوا۟ مِن طَيِّبَٰتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّآ أَخْرَجْنَا
لَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَلَا تَيَمَّمُوا۟ ٱلْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ وَلَسْتُم
بِـَٔاخِذِيهِ إِلَّآ أَن تُغْمِضُوا۟ فِيهِ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ حَمِيدٌ
﴿٢٦٧﴾ ٱلشَّيْطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِٱلْفَحْشَآءِ
وَٱللَّهُ يَعِدُكُم مَّغْفِرَةً مِّنْهُ وَفَضْلًا وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٦٨﴾
يُؤْتِى ٱلْحِكْمَةَ مَن يَشَآءُ وَمَن يُؤْتَ ٱلْحِكْمَةَ فَقَدْ
أُوتِىَ خَيْرًا كَثِيرًا وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٢٦٩﴾



﴿[٢٦٦] ایود احدکم ان تکون لە جنة من نخیل واعناب﴾ ئاخۆ کێتان حەز بکاو پێی خۆشبێت: باخێکی لە گشت جۆرە خورماو، گشت جۆرە رەزێك هەبێ ﴿تجری من تحتها الأنهار﴾ و بە خورەم ئاوی رووبار بەبنکی دارەکانیدا بڕواو ﴿لە فیها من کل الثمرات﴾ هاتبنە بەروو هەموو جۆرە میوەیەکیشیان تیابێت- سەرەڕای خورماو ترێ- ﴿واصابە الکبر﴾ پیرییش پەکی خستبێ ﴿ولە ذریة ضعفاء﴾ لەگەڵ ئەوەیشدا کۆمەڵێ مناڵە وردەی لاوازو بێ هێزیشی هەبێ و، نەتوانن بەهیچ ئیشێ هەڵسن ﴿فأصابها إعصار فیه نار﴾ لە ناکاو گێژەڵووکەیەکی پڕ لە گڕەی لێهەڵکا ﴿فاحترقت﴾ و بسووتێ، ئیتر خۆی و ماڵ و منداڵی بەسەر گەردانی و هەناسە ساردی بمێننەوە، دیارە کاری وا زۆر جێگەی نیگەرانی و داخ وحەسرەتە، بێگومانبە ئەوکەسەش کە لەدونیادا دارایی بەخت دەکاو، پاشان بەڕیاو منەت و ئازاردان خێرەکەی باتڵ دەکاتەوە، هەر ئاوا لە رۆژی قیامەتا رەنجەڕۆ دەبێت، لە کاتێکدا زۆریش پێویستیەتی و، زۆریش تەنگانەیەتی ﴿کذلك یبین الله لکم الآیات لعلکم تتفکرون﴾ هەمیشە ئاوەو شێوە خوا بەڵگەو نیشانەکانی خۆی روون ئەکاتەوە بۆتان، تا بەڵکو بەوردی بیرێ بکەنەوەو پەندو ئامۆژگاریان لێ وەرگرن و، لە کاروکردەوەی ریابازیی و، منەت خستنە سەرخەڵك کۆتا بکەن.

رێنمایی ئایەتی (٢٦٥-٢٦٦):

١- مەسەل ونموونە هێنانەوە بۆ نزیك خستنەوەی ماناو مەبەست لە زەینی گوێ گراندا، شتێکی زۆر چاك و سوود بەخشە، بۆیە خوا ئەو یەك دوو نەزیلەیە هێنایەوە .

٢- خێرو سەدەقەی بێ منەت و بێ ئازار و بێ ریا، پاداشەکەی چەند بەرامبەر دەبێت، خێرو بێری سەدەقەی پیاوی منەت کارو، ریابازو، ئازاردەریش، باتڵ و بێ خێر دەبێت.

٣- لێکۆڵینەوەو بیرکردنەوە لە نیشانەکانی خوا بۆ چەسپاندنی بیروباوەڕ کارێکی پێویستە.

**لەماڵی پاك و حەڵاڵ ببەخشن:**

﴿٢٦٧ یا ایها الذین آمنوا انفقوا من طیبات ماکسبتم ومما اخرجنا لکم من الأرض﴾ ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە! لەو ماڵە چاك وپاكە كە لەرێگەیەكی پەسەندوو حەڵاڵەوە بەدەستتان هێناوە، لەوەش كە لەزەوی دەرمانخستووە بۆتان ببەخشن ﴿ومما اخرجنا لکم من الأرض﴾ وە هەروەها لەو بەروو بووانەش لەزەوییدا بۆمان رواندون ﴿ولا تیمموا الخبیث منه تنفقون﴾ بەدوای بەخشینی شتێكی ناپوخت و بێ كەڵكی وادا مەگەڕێن، واتە: مەچن خراپەكەی لێ جیا بكەنەوەو بیدەن لەرێگەی خوادا ﴿ولستم بآخذیه إلا أن تغمضوا فیه﴾ لەكاتێكدا – خۆخۆشتان بن– لەباتی ئەوهەژارە گەر چاوپۆشی نەكەن وەری ناگرن، باشە! ئەی خوای گەورە– كە لەهەموو شتێك بێنیازە – چۆن وەری دەگرێ؟ ﴿واعلموا أن الله غنی حمید﴾ چاك بشزانن كە بەراستیی خوا لەگشت بەخشینێكی ئێوە دەوڵەمەندو بێ نیازەو، كەڵكەكەیشی بۆ خۆتان دەگەرێتەوە، سوپاس كراویشە، تەنها هەر ئەویش شایەنی سوپاسە، واتە: بوونەوەر گشت پێویستی بەوە. ﴿٢٦٨ الشیطان یعدکم الفقر﴾ لەكاتی بەخشییندا شەیتان بەڵێنی هەژاریی ونەدارییتان پێدەداو پێتان ئەڵێت: ئەگەر ببەخشن، لات وهەژار دەكەون! بۆ ئەوە دەست بنووقێنن ﴿ویأمرکم بالفحشاء﴾ هێمان بۆ كاری ناشیاویش وەك (ڕژدیی و چرووكیی) ونەبەخشین و هەر تاوانێكی تر هەڵتان دەنێت ﴿والله یعدکم مغفرة منه وفضلا﴾ خواش بەڵێنی لێبوردن و فەزڵ و بەهرەی خۆیتان پێدەدا، واتە: بەڵێنتان دەداتێ كە ئەو سامانەی بەخششی تیا بكرێ، پیتی تێ بخات بۆتان ولە هەڵەو پەڵەكانیشتان ببورێ. ﴿والله واسع علیم﴾ خوا خاوەنی نیعمەتێكی فراوانە و، زۆر زاناو بە ئاگایە بە هەموو كردارو نیازێكتان. ﴿٢٦٩ یؤتی الحکمة من یشاء﴾ دانایی و حیكمەتی خۆیشی دەدا بەهەركەسێ خۆی بیەوێ" قورئان و فەرموودەكانی پێغەمبەری بەوردیی تێ ئەگەیەنێ"و فێری دەكات ﴿ومن یؤت الحکمة فقد أوتی خیرا کثیرا﴾ بەهەر كەسیش حیكمەت و زانایی قورئان و فەرمووده بدرێ" دیارە خێرو چاكەیەكی زۆری پێ دراوە" دەرگای دونیاو قیامەتی لێ والآ كراوە ﴿وما یذکر إلا أولوا الألباب﴾ خاوەن بیرو هوشمەندان نەبێ، كەسانی تر لەو بەهرەیە تێ ناگەن و ئامۆژگاری وەرناگرن" چونكە هەموو كات هەر مرۆڤە ژیرەكانن بە ئامۆژگاری یەكانی خوا بەهرەمەند بوونە.

رێنمایی ئایەتی (٢٦٧–٢٦٩):

١– زەكات هەم لەدراوا، هەم لە مەڕو ماڵاتا، هەم لەبەرو بووی زەوییدا فەرز وپێویستەو دەبێ بدرێ.

٢– زەكات و بەخشین لە ماڵی خراپدا كارێكی نابەجێ وناپەسەندە.

٣– وریا بوون لە دەغدەغەو خەتەرەی شەیتان لەكاتی بەخشینی ماڵدا.

٤– مەزنیی پلەو پایەی زانست و زانیاریی بەسەر ماڵ و ساماندا.

﴿٢٧٠ وما انفقتم من نفقة﴾ بە شێوەیەكی گشتیی هەر شتێ ئێوە ئەیبەخشن" چاك، یان خراپ،" ﴿أو نذرتم من نذر﴾ وە یان هەر نەزرێ دەكەن لە سەرخۆتان بۆ ئەنجامدانی هەر فەرمانێكی خوا، وە یان بۆكردنی هەر گوناحێك، بۆنموونە: (نەزر بێت قسەت لە گەڵ نەكەم!) ﴿فإن الله یعلمه﴾ بێگومانبن خوا پێی ئەزانێ و، پێی بەئاگایەو، پاداشیشتان ئەداتەوە ﴿وما للظالمین من انصار﴾ و بۆ ستەمكارانیش" ئەوانەی وا زەكات نادەن، یان سامان لەرێی گوناهدا بەخت دەكەن، لە رۆژی قیامەتدا هیچ جۆرە یارمەتی دەرێك نییە و كەس فریایان ناكەوێ. بەڵێ.. مەبەست بە هەر نەزرێك نزیك بوونەوە بێت لەخوا، ئەوە لای خوا پەسەندەو چاكەو، پێویستە جێبەجێش بكرێ، خۆ هەر

نەزرێکیش لە رق هەستانەوە بێت–وەکو ئەوە بڵێت: ئەگەر لەگەڵ فڵانە کەسدا قسە بکەم، ئەبێ چوار رۆژ بە رۆژووبم– ئەوە ئەم جۆرە نەزرە ناپەسەندەو دانامەزرێ ونابێ کاری پێبکرێت.

**ماڵ بەخشین بەئاشکراو بەنهێنی:**

﴿[٢٧١] إن تبدوا الصدقات فنعما هی﴾ ئەگەر ئێوە خێرو صەدەقەو بەخشین بەئاشکرا بکەن، کارێکی باش وچاکتان کردووە ، چونکە صەدەقە بەوجۆرە، دەبێتە مایەی چاولێکردنی خەڵك لێتان ﴿وإن تخفوها وتؤتوها الفقراء فهو خیر لکم﴾ خۆ ئەگەر بە نهێنی بیکەن و بیشارنەوەو، دەستی هەژارانی پێبگرن، ئەم بارەیان باشترە، چونکە لە ریاو رووپامایی دەپارێزرێن ﴿والله بما تعملون خبیر﴾ و خوا لە هەرکارێ ئێوە ئەیکەن– ئاشکرایی و، نهێنیی– ئاگادارە. زانایان ئەڵێن: ئەگەر ئەنجامدانی ئەوخێرو چاکەیە لەماڵێکی زەکات بێت ، ئەگەر بە ئاشکرا بدرێ، چاکترو باشترە، خۆ ئەگەر صەدەقەیەکی سووننەت و پیاوەتی بێت ، بە نهێنی بدرێ باشترە ﴿[٢٧٢] لیس علیك هداهم﴾ ئەی پێغەمبەر! ﷺ خستنە سەر رێگەی راستی ئەو خەڵکانە، ئەرکی سەرشانی تۆ نیە، واتە: ئەر رێنما نەبوون ونەکەوتنە سەر رێی راست، تۆ بەرپرس نابیت. ﴿ولکن الله یهدی من یشاء﴾ بەڵام خوا مەیلی لەهەر کەسێك هەبێ بیخاتە سەر راستە رێ، هیدایەت و رێنمای دەکا.

وَمَآ أَنفَقۡتُم مِّن نَّفَقَةٍ أَوۡ نَذَرۡتُم مِّن نَّذۡرٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ
يَعۡلَمُهُۥۗ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنۡ أَنصَارٍ ﴿٢٧٠﴾ إِن تُبۡدُواْ
ٱلصَّدَقَٰتِ فَنِعِمَّا هِيَۖ وَإِن تُخۡفُوهَا وَتُؤۡتُوهَا ٱلۡفُقَرَآءَ
فَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۚ وَيُكَفِّرُ عَنكُم مِّن سَيِّـَٔاتِكُمۡۗ
وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ﴿٢٧١﴾ ۞ لَّيۡسَ عَلَيۡكَ هُدَىٰهُمۡ
وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهۡدِي مَن يَشَآءُۗ وَمَا تُنفِقُواْ مِنۡ خَيۡرٖ
فَلِأَنفُسِكُمۡۚ وَمَا تُنفِقُونَ إِلَّا ٱبۡتِغَآءَ وَجۡهِ ٱللَّهِۚ
وَمَا تُنفِقُواْ مِنۡ خَيۡرٖ يُوَفَّ إِلَيۡكُمۡ وَأَنتُمۡ لَا تُظۡلَمُونَ
﴿٢٧٢﴾ لِلۡفُقَرَآءِ ٱلَّذِينَ أُحۡصِرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ
لَا يَسۡتَطِيعُونَ ضَرۡبٗا فِي ٱلۡأَرۡضِ يَحۡسَبُهُمُ
ٱلۡجَاهِلُ أَغۡنِيَآءَ مِنَ ٱلتَّعَفُّفِ تَعۡرِفُهُم بِسِيمَٰهُمۡ
لَا يَسۡـَٔلُونَ ٱلنَّاسَ إِلۡحَافٗاۗ وَمَا تُنفِقُواْ مِنۡ خَيۡرٖ
فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ ﴿٢٧٣﴾ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمۡوَٰلَهُم
بِٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ سِرّٗا وَعَلَانِيَةٗ فَلَهُمۡ أَجۡرُهُمۡ عِندَ
رَبِّهِمۡ وَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴿٢٧٤﴾




**رێنمایی ئایەتی (٢٧٠-٢٧١):**

١– هەڵنانی مرۆڤ بۆ ئەنجامدانی سەدەقە، هەرچەندە کەمیش بێ.

٢– خۆ دوور گرتن لە ریاو، لە بەخشینی ماڵی بەدو خراپ.

٣– سەدەقە کردن بە ئاشکرا– کاتێ بزانرێ ریای تێناکەوێ.

٤– سەدەقەی سووننەت بە پەنهانی بکرێ باشترە، وەك لەم فەرمودەدا هاتووە: ((صدقة السر تطفیء غضب الرب)) واتە: سەدەقە کردن بە نهێنی، تووڕەیی خوا دەکوژێنێتەوە. یان دەفەرموێ: (سبعة یظلهم الله في ظله یوم لا ظل إلا ظله، إمام عادل، وشاب نشأ في عبادة الله، ورجلان تحابا في الله اجتمعا علیه و تفرقا علیه، ورجل قلبه معلق بالمسجد إذا خرج منه حتى یعود الیه، ورجل ذکر الله خالیا ففاضت عیناه، ورجل دعته امرأة ذات منصب وجمال فقال: إني أخاف الله رب العالمین ، ورجل تصدق بصدقة فأخفاها حتى لا تعلم شماله ماینفق یمینه). واتە: حەوت کەس هەن–لە رۆژی قیامەتدا–خوای گەورە دەیانباتە بن سێبەری خۆیەوە، کە بێ لەو، سێبەرێ نابێ بۆ حەوانەوە لەو رۆژەدا: پێشەوایەکی عادڵ ودادگەر، لاوێك لە ناو خواپەرەستیدا پێگەیشتبێت، دووکەس هەر لەبەر خوا پێکەوە کۆ ببنەوە و، هەر لەبەر خوایش لێك جیاببنەوە، کەسێکیش هەمیشە دڵی بە مزگەوتەوە بەسترابێت هەردەم بچێ وبێت. پیاوێکیش لە چۆڵەوانیدا یادی

خوا بکاو، هەر لە بەرخوایش بگریی و ئەسرین بریژێ. پیاوێکیش ئافرەتێکی خاوەن حەسەب و نەسەب وجوان بانگی بکات بۆکاری دزێو وفاحیشە لە گەڵیا، کەچی خۆی نەدا بە دەستەوە و بڵێ: من لەترسی خوا ناوێرم. پیاوێکیش کە خێرو سەدەقە بکات، ئەوەندە بە نهێنی بیکات، دەستی چەپی بە دەستی راستی نەزانێ. زەکات دەریش ئەگەر بزانێ خەڵکانی تریش چاوی لێدەکەن، دەبێ بە ئاشکرا بیکا. یارمەتیدەران لە"مەدینە"دا وەك ئیمامی تەبەریی دەڵێت- لە نێوان هاوبەشدانەرەکاندا خزمو ناسراوو دۆستیان هەبوو، ئەوسا لەکاتی خێرو خێراتدا خۆیان ئەپاراست تا دەستی ئەوانە نەکەوێت، لەولایشەوە هەوڵیان لەگەڵ ئەدان کە باوەڕ بێنن وموسڵمان بن، جا ئەم ئایەتەی: (لیس علیك هداهم...) لەگەڵ مۆڵەتدان بە (صەدەقەی سوننەت) پێیان هات ﴿وما تنفقوا من خير فلأنفسكم﴾ هەرچی لە خێر(ماڵ) ببەخشن، کەڵك و سوودەکەی هەر بۆ خۆتان ئەگەڕێتەوە لە دونیاو، لە قیامەتدا ﴿وما تنفقون إلا ابتغاء وجه الله﴾ دیارە ئێوەش -ئەی ئیمانداران!- هەر لە بەر رەزامەندی خوا گشت خێرێ دەکەن ﴿وما تنفقوا من خير يوف إليكم وانتم لا تظلمون﴾ هەر خێرێکیش دەکەن لەبەر خوا، پاداشەکەیتان بەچەند بەرامبەر دەدرێتەوە، بێ ئەوەی هیچ ستەمێکتان لێ بکرێ.

## ئەمانە شیاوی خێرو خێراتن:

پاشان دێتە سەر باسی ئەوکەسانە کە شیاوترن خێرو خێراتیان بدرێتێ، وەکو دەفەرموێ: ﴿[٢٧٣] للفقراء الذين احصروا في سبيل الله﴾ خێرو بەخشین شیاوی ئەو موهاجیرە هەژارانەیە کە لە پێناوی سەرخستنی ئایینی خوادا، رێیان لەجموجوڵ لێ گیراوە، لەکردوو کەسابەت دەست و پێیان بەستراوە، چونکە خۆیان تەرخانکردووە بۆ جیهاد، بۆ خوێندن، بۆ هەرکارێکی دی کە خێری گشتی تێدا بێت. ﴿لا يستطيعون ضربا في الأرض﴾ ناتوانن- بە هۆی دوژمنانی ئیسلامەوە- بۆ خۆشیان هەوڵێ بدەن و بگەڕێن بۆ بازرگانی و شتی وا، هە تا بەشکو پارووە نان پەیدا بکەن. ﴿يحسبهم الجاهل أغنياء من التعفف﴾ ئەو کەسەی کە شارەزای ژیانیان نەبێ ونەیان ناسێت، لەبەر عیففەت و نەفس بەرزییان، وادەزانێت دەوڵەمەندو بێ نیازن، چونکە خۆیان لە خواردن و خواردنەوە زۆر بێ نیاز نیشان ئەدەن. ﴿تعرفهم بسيماهم﴾ تۆ ئەی پێغەمبەر! ﷺ بەسەرو سیمایاندا ئەیانناسیت- کە چەن نەفس بەرزو بێباکن لە ژیان، ئەگەرچی بێ دەسەڵات و هەژاریشن. ﴿لا يسألون الناس إلحافا﴾ بەزۆریش داوای هیچ شتێ لەخەڵك ناکەن ﴿وما تنفقوا من خير فإن الله به عليم﴾ ئێوەش هەر سامانێکی باش - لە رێگەی خوادا - ببەخشن، بێگومانبن خوا پێی ئاگایەو لای ون نابێت، - هەرچەند زۆر بە نهێنیش بێت. ئەمانە کە ئەم ئایەتە باسی پەسنەکانی کردن، نزیکەی (٣٠٠-٤٠٠) کەسێك بوون، لە مەککەوە هیجرەتیان کردبوو وهاتبوونە مەدینە، پاشان بە هۆی سەرقاڵبوون بە (جیهاد)ەوە دەستیان بەسرابوو و، هیچیان پێ نەدەکرا، پەیامبەریش ﷺ ساباتێکی بۆ کردبوون و هەر خەریکی لەبەرکردنی قورئان بوون، هەر کاتێکیش بچوبا بۆ غەزایەك، لەگەڵ خۆی دەیبردن، کە ئەیشگەڕانەوە پاسەوانی ماڵەکەیان ئەکرد.. جابۆ لەمەو پاشیش تا رۆژی قیامەت هەرکەسێ ئەو سیفەتانەی تێدابێت ، شایستەی ئەو جۆرە دەسگیرۆیی و صەدەقەیە دەبێ، تا بتوانێ درێژە بە ئیش و کارەکانی بدا ﴿[٢٧٤] الذين ينفقون أموالهم﴾ ئەو کەسانەی کە ماڵ ودارایيان ئەبەخشن ﴿بالليل والنهار سرا وعلانية﴾ بە شەوو بە رۆژ، بە نهێنی و بە ئاشکرا، واتە: دەستیان قەت لە خێروخێرات نابڕێ" ﴿فلهم اجرهم عند ربهم﴾ لای پەروەردگاریان پاداشیان مسۆگەرە ﴿ولا خوف عليهم ولاهم يحزنون﴾ ئیتر نەهیچ ترسێکی رۆژی دوایی ڕوویان تێدەکاو، نە خەفەتبارو زویریش دەبن" بۆ دونیایان.

## ڕێنمایی ئایەتی (٢٧٢-٢٧٤):

١- صەدەقەی سوننەت بە کافرانیش دەشێ، پاداشتی صەدەدقەکەیش هەر بۆخاوەن صەدەقەکەیە.

٢- دەبێ هەمیشە ئیخلاص لە سەدەقەدا هەبێ.

٣- بە پێی نیازی خاوەن سەدەقەکە، پاداشی صەدەقەکەش دەگۆڕدرێ.

٤- فەزیلەتی عیففەت و سواڵ نەکردن و دەستپان نەکردنەوە لەم و لەو، هەرچەندە زۆریش ئاتاج و مۆتاج بێ.

٥- ئیلحاح وپێداگرتن لە داواکردن و سواڵدا کارێکی زۆر ناپەسەندو دزێوە.

٦- بەشەوو بە ڕۆژ، بەنهێنی و بە ئاشکرا، خێرو سەدەقە دەکرێ.

٧- خوا مزگێنی بەبڕواداره بەخشەرەکان ئەدا کە: پاداش و کرێیان لای خوای خۆیان حەتمیی و مسۆگەردەبێ و، نایشهێڵێ خەفەت بخۆن وخەمباربن بۆ دونیایان.

الجزء الثالث سورة البقرة

ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ ٱلرِّبَوٰاْ لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِى
يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيْطَٰنُ مِنَ ٱلْمَسِّ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْبَيْعُ
مِثْلُ ٱلرِّبَوٰاْ وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلْبَيْعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْ فَمَن جَآءَهُۥ مَوْعِظَةٌ
مِّن رَّبِّهِۦ فَٱنتَهَىٰ فَلَهُۥ مَا سَلَفَ وَأَمْرُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ وَمَنْ عَادَ
فَأُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٧٥﴾ يَمْحَقُ
ٱللَّهُ ٱلرِّبَوٰاْ وَيُرْبِى ٱلصَّدَقَٰتِ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ كَفَّارٍ أَثِيمٍ ﴿٢٧٦﴾
إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ
وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ لَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ
وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٢٧٧﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ
وَذَرُواْ مَا بَقِىَ مِنَ ٱلرِّبَوٰٓاْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٢٧٨﴾ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُواْ
فَأْذَنُواْ بِحَرْبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُءُوسُ
أَمْوَٰلِكُمْ لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ ﴿٢٧٩﴾ وَإِن كَانَ
ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَىٰ مَيْسَرَةٍ وَأَن تَصَدَّقُواْ خَيْرٌ لَّكُمْ
إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٢٨٠﴾ وَٱتَّقُواْ يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى
ٱللَّهِ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٢٨١﴾

٤٧

### حاڵیی سوود خۆرەکان :

﴿[٢٧٥] الذين يأكلون الربا لا يقومون﴾ ئەوکەسانە سوود ئەخۆن، (دینارێك بە دوودینار ، یان بە زیاتر دەدەن) کە لە گۆڕ دەنرێن پاشان زیندوو ئەکرێنەوەو ڕاست دەبنەوە ﴿إلا کما یقوم الذي یتخبطه الشیطان من المس﴾ وا ڕاست دەبنەوە هەر دەڵێی شەیاتینی دەستی لێ وەشاندوون. عەرەبەکان بە مرۆڤی پەرکەمداروو فێداریان دەگوت: جنۆکە دەستی لێ وەشاندووە، ئەوجا قورئانی پیرۆزیش لەسەر زمانی ئەوان هات، بەکورتیی: پیاوی سوود خۆر لە ڕۆژی قیامەتدا وەکو مرۆڤی پەتەڕیی و شێتی لێدێ ﴿ذلك بأنهم قالوا إنما البیع مثل الربا﴾ چونکە لە دونیادا دەیانگوت: مامەڵەو کڕین و فرۆشتنیش، هەر وەکو مامەڵەکردن بە سوود وایە" واتە هەردوکیان بەلای ئەوانەوە یەکسانن،" چونکە ئەوان باوەڕیان بەحەرام وحەلاڵ نییە؟ ﴿وأحل الله البیع وحرم الربا﴾ خۆ خواش کڕین و فرۆشتنی ڕێداوەو" سوود خۆریشیی حەرام و یاساغکردووە. ﴿فمن جاءه موعظة من ربه فانتهی﴾ ئینجا هەر کەسێك ئامۆژگاری پەروەردگاری بۆهات و بەگوێشی کردو وازی لە سوود خواردن هێنا ﴿فله ما سلف وامره إلی الله﴾ ئیتر ئێستا لە سوودێ کە لەبەرا خواردوویەتی، چاوپۆشی ئەکرێ چونکە ئەوە پێش یاساغبوونی ڕیبا بووە، لەمەودوایش حەواڵەی لای خوا دەکرێ، ئەویش بۆی هەیە لێی خۆش ببێ ﴿ومن عاد فأولئك أصحاب النار﴾ هەرکەسیش-پاش ئەم بڕیارە- گەڕایەوە بۆ سوود خواردن، دەبنە یارو هاوڕێی ئاگر ﴿هم فیها خالدون﴾ بە هەتا هەتاییش تێیدا ئەمێننەوە چونکە ڕیبایان بەحەلاڵ زانیوەو بەوەش کافر بوون.

### خوا فەرو پیت لە ماڵی سووددارردا هەڵ دەگریٚ:

﴿٢٧٦ يمحق الله الربا ويربي الصدقات﴾ خوا فەڕ وپیتی سوود خۆری ناهێڵیٚ ، واتە: هەر داراییەك ریبای تیٚدا بیٚت، دەرەنجام هەر تیا دەچیٚت، بەڵام خیٚروخیٚراتی ماڵ و سامانی سەدەقە، خوا بەفەزڵی خۆی زیادی ئەکات وپیتی تیٚدەخات بۆ خاوەنەکەی ﴿والله لا يحب كل كفار اثيم﴾ بەراستی خوا هەموو کافرو بیٚ باوەڕیٚکی دڵڕەق و گوناحکاری خۆش ناویٚ، واتە: ئەوانەی سوود خۆری دەکەن و بەحەلاڵیشی دەزانن، خوا نەناس و دڵرەق و بیٚ میهرەبانن بەرامبەر بەخەڵکانی هەژارو پەککەوتە، ئەگینە چۆن بە جوامیٚرانەوە مەردانە قەرزیان نادەنیٚ و، دەچن (فائیدە)و قازانجیٚك دەخەنە سەریان؟ ﴿٢٧٧ إن الذين آمنوا وعملوا الصالحات﴾ بەراستیی ئەو کەسانە کە باوەڕیان هیٚناو، ئاکاری چاکیان کرد ﴿واقاموا الصلاة وآتوا الزكاة﴾ و نویٚژەکانیان بەهۆش و گۆشەوە ئەنجامداو زەکاتیشیان بە خەڵکانی شیاو بەخشی ﴿لهم اجرهم عند ربهم﴾ پاداشیان وا بەلای پەروەردگاریانەوە ﴿ولا خوف عليهم ولاهم يحزنون﴾ نەهیچ ترسیان ئەبیٚ لە دوارۆژدا، نە خەفەتبارو دڵگرانیش ئەبن بۆ دونیایان

رێنمایی ئایەتی (٢٧٥-٢٧٧):

١- تۆڵەی سوودخۆر لە رۆژی قیامەتدا -ئەگەر تەوبە نەکا- مسۆگەرە.

٢- سوود بەبەڵگەی ئایەتەکەو چەندین فەرموودەی سەحیح و دروست، حەرامە.

٣- بەیع وکڕین و فرۆشتن -بە مەرجەکانیەوە- حەڵاڵە.

٤- هەڕەشەی سەختی خوا بۆ کەمکردنەوەو لە ناوبردنی ماڵی سوود دار، بەڵێنیشی بۆ زیاد کردنی ماڵی سەدەقەو پیت تیٚخستنی.

### لە پاشماوەی سوود وازبیٚنن:

﴿٢٧٨ ياايهاالذين آمنوا اتقوا الله وذروا ما بقي من الربا﴾ ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هیٚناوە! دەبیٚ بە تەواوی ملکچی فەرمان و، قەدەغە کراوەکانی خوابن" و لە گشت سنوورەکانی پاریٚز بکەن و، لە پاشماوەی سوودەکەشتان-کە بەلای ئەم وئەوەوەیە واز بیٚنن و، داوای مەکەن ﴿إن كنتم مؤمنين﴾ ئەگەر باوەڕداری راستەقینەن، دەبیٚ گوێڕایەڵی تەواوی فەرمودەکانی خوابن و، لەو سوودەش بیٚدەنگ بن ﴿٢٧٩ فإن لم تفعلوا﴾ خۆ ئەگەر واتان نەکرد و، دەستتان لە سوود خۆری هەڵنەگرت" ﴿فاذنوا بحرب من الله ورسوله﴾ ئەوسا جەنگیٚکی گەورە رابگەیەنن لەگەڵ خواو پەیامبەرەکەیدا ﷺ، چونکە سوود خۆری دژایەتی کردنی فەرمانەکانی خواو پیٚغەمبەری خوایە، واتە: سوود خواردن ئیعلانی جەنگە لەگەڵ خواو پیٚغەمبەردا ﴿وان تبتم﴾ وە ئەگەر دەست لە سوود خۆری هەڵگرن و پەشیمان ببنەوە لیٚی ﴿فلكم رؤس اموالكم لا تظلمون ولا تظلمون﴾ سەرمایەکانی ماڵی خۆتان بە تەنهاو(بیٚ سوود) بسیٚننەوە لە قەرزارەکان، ئیتر نە ئیٚوە لە قەرزارەکان ستەم کەن و واتە:" زیاد لە ماڵەکەی خۆتان وەرمەگرنەوە " وەنە لەلایەن ئەوانیشەوە ستەمتان لیٚکریٚ:" هەر بەو جۆرە کە کەمتر لە سەرمایەکەتان بدریٚتەوە" ﴿٢٨٠ وإن كان ذو عسرة فنظرة إلى ميسرة﴾ ئەگەر قەرزارەکەش دەست تەنگ ونەدارابوو" دەبیٚ تادەسەلات پەیدا دەکا بۆ بژاردنەوەی قەرزەکە ماوەی بدەن ﴿وان تصدقوا خير لكم﴾ خۆ ئەگەر قەرزارەکەتان توانای دانەوەی نەبوو، ئیٚوە ئازادی بکەن وپیٚی ببەخشن گەلیٚ بۆتان باشترە ﴿إن كنتم تعلمون﴾ ئەگەر بزانن ئەم کارە"چ خیٚرو پاداشیٚکی گەورەی تیٚدایە بۆتان"سەرمایەکەشتان دەبەخشی پیٚیان ﴿٢٨١ واتقوا يوما ترجعون فيه إلى الله﴾ خەڵکینە! لە سزای رۆژیٚك بترسن کە هەمووتان تیٚیدا ئەهیٚنریٚنەوە بۆ لای خوا ﴿ثم توفى كل نفس ما كسبت﴾

لە پاشان هەموو کەسێك پاداشی کارو کردەوەی خۆی بەتەواوی دێتەوە ڕێی ﴿وهم لا يظلمون﴾ ستەمیشیان لێ ناکرێ "کەم و کورتیی لە چاکەکانیاندا ناکرێ، زیادیش لە گوناهەکانیاندا" نادرێ بەکۆڵیاندا.

**ڕێنمایی ئایەتی (٢٧٨-٢٨١):**

١- تەوبەکردن لە سوود خۆری واجب و پێویستە.

٢- سوودو بازاڕی سوود خۆری، دەبێ لە لایەن (حاکم)ێکی شەرعڕەوە وێران بکرێت . (ئیبن خویزمند) ئەڵێ: ئەگەر شارنشینێك سوود خۆرییان کردە پیشەی خۆیان و بەحەڵاڵیان دادەنا ئەوا بە (موڕتەد) دادەنرێن، خۆ ئەگەر لەگەڵ ئەوەیشدا بە حەرامیان دەزانی ، هەر پێویستە ڕابەرو فەرماندەی موسڵمانان جەنگیان لەگەڵ بکا .(ئیبن عەباس) ئەڵێ: ئەگەر کەسێ بەردەوام خەریکی سوودخۆری بوو، پێویستە(ئیمام- ڕابەر)داوای تەوبەی لێبکا، جائەگەر دەستی لێهەڵگرت ئەوەباشە! ئەگینە لەملی دەدرێ. فەرموودەی:(إجتنبوا السبع الموبقات.. آکل الربا) بۆسەختگیری لە سەرسوودە.

٣-(ئیبن عەباس) ئەڵێ: ئەم ئایەتەی ﴿واتقوا یوما..﴾ کۆتا ئایەتی قورئانە، کاتێ جبریل هێنای وتی: لە سەرەتای ئایەتی (٢٨٠)ی سوورەتی (بەقەرە)وە دای بنێن، پەیامبەریش ﷺ دوای ئەوئایەتە تەنها (٢١) ڕۆژ، یان (٨١) ڕۆژ بەسەر دنیاوە ژیا.. بەهەزاران دروودو سڵاوی لە سەربێت.

**وام و مامەڵەی ماوەدار بنووسن:**

ئینجا لە درێژ ترین ئایەتی قورئاندا، باسی (وام =قەرز)دان بەیەکتر بەبێ بەهرە دەکا، لەگەڵ کورتە باسێکی بازرگانیی و (ڕەهن) دا، ئەمەیش ئەوە دەگەیەنێ کە بەلای دینی ئیسلامەوە هاوکاریی کردنی یەکترو قەرز بەیەکتری دان، کارێکی زۆر پێویست وگرنگە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿٢٨٢

الجزء الثالث — سورة البقرة

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيۡنٍ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى
فَٱكۡتُبُوهُۚ وَلۡيَكۡتُب بَّيۡنَكُمۡ كَاتِبُۢ بِٱلۡعَدۡلِۚ وَلَا يَأۡبَ
كَاتِبٌ أَن يَكۡتُبَ كَمَا عَلَّمَهُ ٱللَّهُۚ فَلۡيَكۡتُبۡ وَلۡيُمۡلِلِ
ٱلَّذِي عَلَيۡهِ ٱلۡحَقُّ وَلۡيَتَّقِ ٱللَّهَ رَبَّهُۥ وَلَا يَبۡخَسۡ مِنۡهُ شَيۡـٔٗاۚ
فَإِن كَانَ ٱلَّذِي عَلَيۡهِ ٱلۡحَقُّ سَفِيهًا أَوۡ ضَعِيفًا أَوۡ لَا يَسۡتَطِيعُ
أَن يُمِلَّ هُوَ فَلۡيُمۡلِلۡ وَلِيُّهُۥ بِٱلۡعَدۡلِۚ وَٱسۡتَشۡهِدُواْ شَهِيدَيۡنِ
مِن رِّجَالِكُمۡۖ فَإِن لَّمۡ يَكُونَا رَجُلَيۡنِ فَرَجُلٞ وَٱمۡرَأَتَانِ
مِمَّن تَرۡضَوۡنَ مِنَ ٱلشُّهَدَآءِ أَن تَضِلَّ إِحۡدَىٰهُمَا فَتُذَكِّرَ
إِحۡدَىٰهُمَا ٱلۡأُخۡرَىٰۚ وَلَا يَأۡبَ ٱلشُّهَدَآءُ إِذَا مَا دُعُواْۚ وَلَا تَسۡـَٔمُوٓاْ
أَن تَكۡتُبُوهُ صَغِيرًا أَوۡ كَبِيرًا إِلَىٰٓ أَجَلِهِۦۚ ذَٰلِكُمۡ أَقۡسَطُ
عِندَ ٱللَّهِ وَأَقۡوَمُ لِلشَّهَٰدَةِ وَأَدۡنَىٰٓ أَلَّا تَرۡتَابُوٓاْ إِلَّآ أَن تَكُونَ
تِجَٰرَةً حَاضِرَةٗ تُدِيرُونَهَا بَيۡنَكُمۡ فَلَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٌ
أَلَّا تَكۡتُبُوهَاۗ وَأَشۡهِدُوٓاْ إِذَا تَبَايَعۡتُمۡۚ وَلَا يُضَآرَّ كَاتِبٞ
وَلَا شَهِيدٞۚ وَإِن تَفۡعَلُواْ فَإِنَّهُۥ فُسُوقُۢ بِكُمۡۗ وَٱتَّقُواْ
ٱللَّهَۖ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱللَّهُۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ٢٨٢

٤٨ وإن كنتم

یا أیهاالذین آمنوا إذا تداینتم بدین إلى أجل مسمى فاکتبوه﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! هەرکات قەرزو قۆڵەی ماوەدارتان لەگەڵ یەکتردا کرد، وەیان کڕین وفرۆشتنتان بەقەرزکرد بۆ ماوەیەکی دیاریکراو بینووسن، هەتا بە باشی پارێزگاری بکرێت و، بۆ دوا ڕۆژیش نەبێتە هەراو قڕە" بەڵێ نوسین چاکترین هۆیە بۆ مانەوەی دۆستایەتیی و برایەتیی و مسۆگەر بوونی قەرزەکەیش، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ولیکتب بینکم کاتب بالعدل﴾ با نووسەرێکی خاوەنداد، بەدادگەرانە بینووسێت و، وە بەلای هیچ لایەکدا نەڕواو،" شارەزای یاسای کڕین و فرۆشتنیش بێت" ﴿ولا یأب کاتب ان یکتب کما علمه الله فلیکتب﴾ ناشێ هیچ نووسەرێك سەرپێچی بکا لە نووسینی " قەباڵەکە"دا، هەرچۆنێ خوا فێری نووسینی کردووە، بابینووسێت" واتە: هەرکات داوایان لێکرد کە بۆیان بنوسێ، دەبێ بینوسێ و تەفرەیان نەدات" ﴿ولیملل الذی علیه الحق﴾ خۆ ئەگەر قەرزارەکەش خوێندەوار نەبوو تاخۆی بینوسێ، دەبێ

بۆخۆی هەقەکە بەیان بکاو، نووسەرەکەیش بینووسیٚ ﴿وليتق الله ربه﴾ دەبیٚ لە خوای پەروەردگاری خۆی بترسیٚ ﴿ولا يبخس منه شيئا﴾ ولە کاتی نووسینەکەدا کەمو کورتیی لە هیچ شتێکی نەکات ﴿فإن كان الذي عليه الحق سفيها او ضعيفا﴾ ئینجا ئەگەر قەرزارەکە هەڵەشە ونەزان وکەم ئاوەز بوو" وەیان لە روانگەی ئەقڵەوە بیٚ هێزو لاواز بوو (منالٚ بوو، یا بەساڵا چوبوو) ﴿اولا يستطيع ان يمل هو﴾ وەیان نەیدەتوانی ئەوی پێویستە بیڵیٚ و بنوسریٚ" (کەرولالٚ بوو) یان نەخوێندەوار بوو ﴿فليملل وليه بالعدل﴾ با چاودێرو سەرپەرشتکارەکەی بە دادگەرانە سەنەدەکە دارێژیٚ و. نووسەرەکەیش بینووسیٚ ﴿واستشهدوا شهيدين من رجالكم﴾ دەبیٚ دوو پیاوی موسڵمان لە خۆتان بۆ ئەو کارە شایەدبن" واتە: دەبیٚ موسڵمان و ئازادو باڵغیش بن ﴿فإن لم يكونا رجلين﴾ خۆ ئەگەر دووپیاو دەست نەکەوتن ﴿فرجل وامراتان﴾ با پیاوێك و دووئافرەتی وا ببنە شایەت ﴿ممن ترضون من الشهداء﴾ کە ئێوەش بە شایەتی دانیان رازی بن و پەسەندیان بکەن (دوو ژنەکە پێکەوەبن) ﴿ان تضل احداهما فتذكر إحداهما الأخرى﴾ تا ئەگەر یەکێك لەم دوو ئافرەتە لە بیری چوو، ئەوی تریان وەبیری بێنێتەوە " دووژن لە باتی یەك پیاو لە حساباتی پارەو قەرزو قۆڵەدا پێکەوە شایەت ئەبن، چونکە ئافرەتان زۆر کەم بەم جۆرە حساباتانەوە خەریك دەبن، بەڵام بێگومان لە بابەت ئیش وکاری ناوماڵ و منداڵەوە لە پیاو بیری بەهێزترە، سەرەرای ئەمەیش کە هەندیٚ کات یەك ژن بە دووپیاو حساب ئەکرێت، وەکو لە مەسەلەی کرین وفرۆتندا دوو ژن بە یەك پیاو دا دەنرێت، وەلە هەندیٚ جاردا ژنێك بەدووپیاو دادەنرێت، وەکو شایەتی تەنها ژنێك لەسەرمانەوەی کچێتی کچێك، یان شایەتی مامانێك بۆ لە دایك نەبوونی منداڵ و یا..یا... جا بۆ ئەوە کە خوێنەری بەرێز زیاتر لەم باسە - دووژن لە باتی یەك پیاو بەشایەت بن- ئاگادار ببیٚ دەتوانیٚ سەرێك لە(تەفسیری خالٚ) و، کتێبی (سەربەستیی لە ئیسلامدا) بدات. ﴿ولا يأب الشهداء إذا ما دعوا﴾ هەر وەختێکیش شایەتەکان بانگ کران بۆشایەتیدان، یان بۆ هەڵگرتنی شایەتی، نابیٚ خۆبگرن و ئامادە نەبن ﴿ولا تسأموا ان تكتبوه صغيرا او كبيرا إلى اجله﴾ هەرگیز نابیٚ لە نووسینی ماوەی قەرز- کەمبیٚ، یا زۆر- ماندوو بن و لەشگرانی بکەن وپشتگوێی بخەن ﴿ذلكم اقسط عندالله واقوم للشهادة وادنى الا ترتابوا﴾ ئەو نووسینە بەو شێوەیە لەلای خوا ، دادگەرانە ترو پەسەندترە، چاکتریش دەتوانن شایەتی راگرن و، بۆ نەهێشتنی گومان و دوودڵیش- چ بۆ شایەد، چ بۆ داوەر، چ بۆ قەرزار- باشترە ﴿إلا ان تكون تجارة حاضرة تديرونها بينكم﴾ هەموو کات بینوسن، مەگەر وەختیٚ بازرگانیی، ئاڵوگۆرتان دەست بەدەست و بەنەقدی بێت ﴿فليس عليكم جناح الا تكتبوها﴾ ئەوسا گوناهتان ناگات ئەگەر نەینووسن ﴿و اشهدوا إذا تبايعتم﴾ شاهید بگرن لە کاتی کرین و فرۆشتندا ، ئیتر چ بە حازرو نەقد بیٚ، چ ماوەدارو بە قەرز بیٚ ﴿ولا يضار كاتب ولا شهيد﴾ نابیٚ چ نووسەرو، چ شایەت، زیانتان پیٚ بگەیەنن و ئازارتان بدەن، بەم شێوە کە هەقەکە نەنووسن و، شایەدی بەهەق نەدەن ﴿وإن تفعلوا فإنه فسوق بكم﴾ خۆ ئەگەر وانەکەن، ئەوە لەسنوور دەرچوونەو گوناح لەملی خۆتانە ﴿واتقوا الله﴾ و دەشیٚ لەخوا بترسن ﴿ويعلمكم الله﴾ وە خوا فێری زانست و کاروباری ئاییتتان دەکات،" هەر شتێك لە بەرژەوەندی خۆتاندا بێت نیشانتان ئەدا ﴿والله بكل شئ عليم﴾ و خوایش بە هەموو شتێك زانایە" قازانج و زیانی هەموو شتێك ئەزانیٚ، بۆیە ئا بەو شێوەیە یاسای ژیانتان بۆ دائەنێت .

**ڕێنمایی ئایەتی (٢٨٢):**

١- ئەم ئایەتە: ئاماژەیەکە بۆ (بیع السلم)، وەکو ئەم فەرمووده سەحیحەش بە ڕاشکاوی باسی ئەکا: ((من أسلف فی تمر فلیسلف فی کیل معلوم ووزن معلوم إلی أجل معلوم)) ئاشکرایشە کە (سەلەم) و (سەلەف) یەك مانایان هەیە. (ئیبن جەریر) ئەڵێ: نوسینی قەرزوو قوڵە چ بە کڕین بێ و چ بە فرۆشتن بێت، یان بە سەلەم، واجیبە.

٢- هەر نیعمەتێك دەبێ هاوکاری خەڵکی پێ بکرێ وەك ئەفەرموێ: (کما علمه الله فلیکتب).

٣- دانانی بریکارو قسەکەر لەباتی خۆ دروستە.

٤- لە هەموو شتێکا دادگەری پێویستە، بەتایبەت لە نوسینی قەرزو فەرزدا.

٥- شایەد دانان بۆ نووسینی (سەنەد، کومپیالە) پێویستە.

٦- شایەدیی سەرماڵ، دەبێ دوو پیاوی ژیری ئازادی موسڵمان بن.

٧- هەمووشتێ- بێجگە لە زینا کە ئەو چوار شایەدی دەوێ- بەکەمتر لە دووشایەد نابێ.

٨- دوو ژنی موسڵمان لە جێی شایەدی پیاوێك دا دەبێ.

٩- سەبارەت بە شایەدی بەندەو منداڵ: جەماوەری زانایان قسەیان وەرناگرن، لە بڕێ کاری سادەدا نەبێ.

١٠- قەرز زۆربێ، یان کەم، دەبێ بنوسرێ.

١١- مامەڵە و بازرگانی نێوان خۆتان بەمەرجێ حازرو نەقدبێ، نوسینی پێویست نیە.

١٢- شایەد بۆ کڕین و فرۆشتنی (عەقار) زەویی، کشت وکاڵ و هەر شتێکی گرنگ واجیبە.

١٣- زیان گەیاندن بەخاوەن هەق لەلایەن شایەدو نووسەرەوە قەدەغەو حەرامە.

الجزء الثالث — سورة البقرة

وَإِن كُنتُمْ عَلَىٰ سَفَرٍ وَلَمْ تَجِدُوا كَاتِبًا فَرِهَٰنٌ مَّقْبُوضَةٌ فَإِنْ أَمِنَ بَعْضُكُم بَعْضًا فَلْيُؤَدِّ الَّذِى اؤْتُمِنَ أَمَٰنَتَهُ وَلْيَتَّقِ اللَّهَ رَبَّهُ وَلَا تَكْتُمُوا الشَّهَٰدَةَ وَمَن يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُ ءَاثِمٌ قَلْبُهُ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴿٢٨٣﴾
لِّلَّهِ مَا فِى السَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى الْأَرْضِ وَإِن تُبْدُوا مَا فِىٓ أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ اللَّهُ فَيَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٨٤﴾
ءَامَنَ الرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ ءَامَنَ بِاللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِ وَقَالُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ ﴿٢٨٥﴾
لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَآ إِن نَّسِينَآ أَوْ أَخْطَأْنَا رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ عَلَيْنَآ إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِنَا رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِ وَاعْفُ عَنَّا وَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَآ أَنتَ مَوْلَىٰنَا فَانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَٰفِرِينَ ﴿٢٨٦﴾

٤٩

١٤- تەقوا دەبێتە مایەی زیادبوونی زانست وزانیاریی.. تادادوەر بۆ خۆی شایەد بانگ نەکا پێویست نی یە لە خۆیەوە بچێت شایەدی بدا، ئەگەر چی فەرمووده هەیە: سەبارەت بەو کەسانەی مافی ئاگادارن و بە قسەیەکی ئەوان دەر دەکەوێ، لە حاڵەتی وادا دەبێ لە خۆیانەوە،-بێ پێوتن- بچن شایەدی بدەن، دیارە شایەتی وا بەباشترین شایەتی ناوهێنراوە چونکە دەبێتە هۆی دەرخستنی مافێك، کە لەڕێگای ئەوەوە نەبێت دەرنەکەوێت.

**ئەر نەتان نووسی بارمتە وەرگرن:**

﴿وإن كنتم على سفر ولم تجدوا كاتبا فرهان مقبوضة﴾[٢٨٣] خۆ ئەگەر لەسەر سەفەر بوون- ئەی ئەوانەی قەرزو مامەڵە دەکەن!- و خوێندەوارتان دەست نەکەوت، قەباڵەکەتان بۆبنووسێت، دەکرێ بارمتەو گرەوێك لای خاوەن قەرزەکە دابنێن، تاوەك سەنەدێك لای بمێنیتەوە"و دڵنیا بێت ماڵەکەی تیاناچێت ﴿فإن أمن بعضكم بعضا﴾ ئینجا

ئەگەر بڕواتان بەیەکدی هەبوو و ئەمین بوون‌و بارمتەی نەویست ﴿فليؤدّ الذى اؤتمن امانته وليتق الله ربه﴾ جا با ئەو کەسەی کە بە ئەمین دانراوە، واتە: قەرزدارەکە لەکاتی خۆیدا سپاردەکە" قەرزەکە" بداتەوە بەخاوەنەکەیی‌و، لە خوای پەروەردگاری خۆی بترسیّ و،" گزی تیا نەکات" ﴿ولا تكتموا الشهادة﴾ دووبارە روو دەکاتەوە شایەتەکان‌و: ئەفەرمویّ: ئەی شایەتەکان! نابیّ خۆتان لەشایەتی بشارنەوە" هەرکات پێویست بوو " ﴿ومن يكتمها فإنه آثم قلبه﴾ وە هەرکەسێك کیتمانی شایەتی بکاو بیشارێتەوە، بە راستیی دڵی خۆی ژەنگاوی‌و تاوانبارەدەکا ﴿والله بما تعملون عليم﴾ خۆ خواش بەوکارانەی ئێوە ئەیکەن زاناو ئاگایە" کەوابوو هیچ شتێك لە یەکتر مەشارنەوە".

**ڕینمایی ئایەتی (٢٨٣):**

١- دانانی بارمتەو گرەویّ (رەهن)ێك لای خاوەن قەرزەکە ، لەماڵەوە بێت ، یان لە سەفەردا بێت ، -هەتا قەرزەکەی تیا نەچیّ- کارێکی پەسەندو رەوایە. بەڵیّ..(رەهن) بە پێی دەقی قورئان بە تایبەت بەم ئایەتەی بەردەستمان و لە سەفەردابن. هەروا ئەگەر لە ماڵەوەش بن، بە سوننەت دانراوەو بە کۆی دەنگی ئوممەت چەسپێنراوە، لە فەرموودەیەکی (متفق عليه) دا هاتووە : (إن النبيﷺ إشترى من يهودى طعاماً فطلب اليهودي رهنا، فرهنه درعه ﷺ فمات ودرعه مرهونة فى ثلاثين صاعاً من شعير).

٢- کاتیّ دڵنیابوون لە تیانەچوونی ماڵەکەتان، ئەوا دەتوانن رەهن وەرنەگرن جا گرەو کراوەکە ، ئەگەر حەیوانێکی سواری بوو، یان مەڕێکی خاوەن شیر بوو، یان خانوویەك بوو تێیدا دادەنیشتن، ئەوە هەقە خاوەنەکەیان سوودیان لیّ وەربگریّ ، نەك خاوەن قەرز، واتە: خاوەن پارەکە بۆی نیە ئەوانە لە قازانجی خۆیدا بەکاربێنیّ، خۆ ئەگەر خاوەن قەرزەکە چوویە خانووەکەوەو بۆ خۆی بەکاری هێنا ، ئەوا دەبیّ کریّ بۆ خاوەنەکەی دابنیّ .

٣- شاردنەوەو کیتمانی شایەدی، یان درۆ کردن لە شایەتییدا ، کارێکی حەرامەو لە گوناحە گەورەکانە.

### هەر چیتان لەدڵ گرتبیّ خوا لێتانی دەپرسیّ:

﴿[٢٨٤] لله ما فى السموات وما فى الأرض﴾ هەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی لەزەویدایە، هەموو هی خوایە" تەنها ئەو دروستی کردووە، تەنها ئەویش خاوەنیەتی، کەواتە: دەبیّ تەنها شەریعەت و بەرنامەی ئەویش پیادە بکریّ" ﴿وإن تبدوا ما فى انفسكم﴾ ئەگەر ئەوەی لەناو دڵ ودەروونتاندایە، ئاشکرای بکەن ﴿او تخفوه يحاسبكم به الله﴾ یان بیشارنەوەو دەری نەخەن، لە هەردوو حاڵەتەکەدا خوا لێکۆڵینەوەتان لەگەڵ دەکات. (ئیبن عەباس) دەڵێت: پاش لێکۆڵینەوەو لێپرسینەوە لەو شتانەی کە لەدڵ‌و دەروونا ئەیشارنەوە، خوای گەورە لە بڕواداران خۆش ئەبیّ و سزای بێبڕوایان دەدات، بۆیە (ئیبن عەباس) بەلایەوە وایە کە ئایەتی: (إن تبدوا ما في أنفسكم أو تخفوه يحاسبكم به الله) نەسخ نەبۆتەوە. تەفسیرەکان لەم جێگایەدا جۆرەها قسەیان هەیە، بەلام ئەم مانایەی مامۆستا "خاڵ" بەلامەوە لە هەموان جوانترە کە دەڵیّ" ئەگەر ئەوەی لە دڵتاندایە لە سیفاتی نەفسیی، وەکو بیّ بڕوایی و، حەسوودیی‌و، ناپاکیی و بەخیلی، ئاشکرایان بکەن، یان بیانشارنەوە، خوا بۆی هەیە حیسابتان لەگەڵ بکات، چاك بە چاك و خراپ بە خراپ". ﴿فيغفر لمن يشاء﴾ ئینجا لە هەرکەسێك کەخۆی بیەویّ خۆش ئەبیّ ﴿ويعذب من يشاء﴾ هەر کەسێکیش ئەو خۆی بیەویّ وشیاویش بیّ - بە سزا - سزای دەدات" واتە: ئەگەر کردەوەو خەیاڵات گەیشتبێتە رادەیەك کە بووبیّ بە شتێکی نەفسیی و سرووشتی، ئەوە هەرگیز تەوبەو پەشیمانی بەدوایا نایەت.

﴿والله على كل شئ قدير﴾ خواش به‌سەر هەموو شتێكدا دەسەڵاتداره" توانای لێبوردن و سزادانیشی هه‌یه" ﴿٢٨٥ آمن الرسول بما انزل إليه من ربه والمؤمنون﴾ ئەم پەیامبەرەو، ئەو ئیماندارانەی لەگەڵیا باوەڕیان هێناوەو لێیان روونه که ئەو بەرنامەیه لە لای پەروەردگاریانەوە هاتۆته خوارێ راستەو دروست ﴿كل آمن بالله وملائكته وكتبه ورسله﴾ وهەمووشیان بڕوایان هێناوه بە تاك وتەنیایی خواو، فریشتەکانی، کتێبەکانیی ، پەیامبەرەکانی ﴿لا نفرق بين أحد من رسله﴾ دەشڵێن: ئێمه هیچ فەرق و جیاوازیەك لەنێوان پێغەمبەرانی خوادا ناکەین ، بڕوامان هەیه که هەموو خوا ناردوونی، وهەریەکەشیان بە بەرنامەی خۆیەوە هاتووه، واتە: ئێمه وەك جوولەکەو گاورەکان ناکەین ، بڕوامان بە هەندێکیان ببیٚ و، بە هەندێکیان باوەڕ نەکەین ﴿وقالوا سمعنا واطعنا﴾ و ئەڵێن: وتەی خوامان بیست و گوێڕایەڵی فەرموودەکانی خواین، ساتۆش ئەی پەروەردگارمان! "هەرچی بفەرمووی ئامادەین" ﴿غفرانك ربنا وإليك المصير﴾ داوای لیٚ بوردنت لیٚ دەکەین، دەسا تۆیش لێمان خۆش ببە ئەی پەروەردگارمان! چاکیش دەزانین کە سەرەنجام گەڕانەوەشمان تەنها بۆ لای تۆیە. بەڵیٚ.. بەو شێوەیه موسڵمانی کامڵ: گوێ بیستە، گوێڕایەڵە، ددان بە ناتەواویی و هەڵەکانی خۆیدا ئەنیٚ، بۆیە لەخوا داوای لێبوردن دەکات و، لە پاشه رۆژ دەترسێت.

## ڕێنمایی ئایەتی (٢٨٥):

١- بەیانی ئەرکان و پایەکانی ئیمان بە خواو، فریشتەکانیی و کتێب و پێغەمبەرانی ئەو.

٢- بڕوا بە هەموو پێغەمبەران واجیبه، هەروەکو بڕوا نەبوون بە هەندێکیان حەرامو کوفره.

٣- ئیتاعه و بەگوێکردنی خواو پیغەمبەرەکەی ، وخۆ بەدەستەوەدان و، رازی بوون بە هەموو بڕیارەکانی خوا پێویستە.

## تەکلیف و ئەرکی بەدەر لەتوانا ناکریٚ:

﴿٢٨٦ لا يكلف الله نفسا إلا وسعها﴾ هەرچەندە خوا لە خەیاڵ وخەتەرەی دڵ و دەروون، دەپرسێتەوە ، بیشارێتەوە "یان دەریخاو بیخاتە روو".. بەڵام لە گەڵ ئەوەیشدا - بەدەر لەتوانا - تەکلیف و ئەرکیٚ ناخاتە سەرشانی هیچ کەسێك ﴿لها ماكسبت﴾ هەر کەسێك کارێکی چاکی ئەنجام دا، پاداش و خێرەکەی بۆ خۆی دەبێت ﴿وعليها ما اكتسبت﴾ وهەر خراپەیەکیشی کرد، بە زیانی خۆیەتیی و، یەخەی خۆی دەگریٚ. ئینجا لە کۆتایی سوورەتەکەدا شێوەی موناجات وپاڕانەوەمان فێر دەکا ودەفەرمویٚ: ﴿ربنا لاتؤاخذنا إن نسينا او اخطأنا﴾ ئەی پەروەردگاری ئێمه ! ئەگەر فەرمانێکی تۆمان لە بیرچوو، یان تێیدا بەهەڵەچووین، لێمان مەگرە ﴿ربنا ولا تحمل علينا أصرا كما حملته على الذين من قبلنا﴾ ئەی پەروەردگارمان..! هیچ تەکلیف و ئەرکێکی ئەوەند قورس و گران مەخە سەرشانمان- ئەگەرچی بشتوانین جێبەجێی بکەین- وەك ئەو ئەرکانەی لەسەر شانی ئەوانەی بەر لەئێمەت نا ﴿ربنا ولا تحملنا مالا طاقة لنا به﴾ ئەی پەروەردگاری ئێمه! ئەرکێکی وا بەسەرماندا مەدە، بۆمان هەڵنەگیریٚ و لە تواناو وزەماندا نەبێت ﴿واعف عنا﴾ چاو پۆشیمان لیٚ بکە ﴿واغفر لنا﴾ هەڵە و تاوانمان بپۆشە ﴿وارحمنا﴾ و ڕەحممان پیٚ بکە ﴿أنت مولانا﴾ هەر ئەتۆش سەرپەرستیارو پشت و پەنامانی ﴿فانصرنا على القوم الكافرين﴾ دەسا بەسەر هۆزو بەرەی بیٚ باوەڕان و خوانەناساندا، سەرمان بخە، واتە: بەڵگەو نیشانەمان فێر بکە، با لە کاتی موجادەلەو دەمەقاڵێدا ، وەلەکاتی رووبەڕوو بوونەوەو جەنگیشیاندا زاڵبین. (موعاز) هەر کە لە خوێندنی ئەم سوورەتە دەبووەوە ئەیوت: (آمين فاللهم آمين).

**ڕێنمایی ئایەتی (٢٨٦):**

١- لابردنی ئەرك و باری گران و قورس لەسەر شانی ئەم ئوممەتە.

٢- تاوانیٚ لە حاڵی لە بیرچوون وهەڵەدا ڕوودا، هیچ سزاو تۆڵەیەکی نیە.

٣- خوشبوون لەو هەڵەو پەلانەی بەدڵدا تێدەپەڕێت.

٤- فێربوون وخوێندنی ئەم دۆعایەی ئاخری سوورەتی (بەقەرە) سوننەتە، چونکە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی هەمووکاتیٚ ئەیان خوێند، لە فەرموودەیەکیشدا - ئیمامی (موسلیم) لە (ئیبن مەسعوود)ـەوە هێناویەتی- دەفەرمویٚ: (من قرأ هاتين الآيتين من آخر سورة البقرة في ليلة كفتاه). واتە: هەر کەسێك-لە هەر شەوێکدا-ئەم دوو ئایەتەی ئاخری سوورەتی (بەقەرە)یە بخوێنیٚ، بۆ ئەو شەوە بەسیەتی. یان هاتووەو دەفەرمویَ: (من قرأهما بعد العشاء مرتين أجزأته من قيام الليل ، وكفتاه من شر الشيطان فلا يكون له عليه سلطان). واتە: هەر کەسێك پاش نوێژی خەوتنان دووجار ئەو دووئایەتە بخوێنیٚ، ئەوا لەباتی شەو نوێژی ئەو شەوە بۆی دەنوسرێت و، لە خراپەو شەڕی (شەیتان)یش پارێزراو دەبیٚ و، دەرەقەتیشی نایەت.

ئێمەش لەکۆتایی تەفسیری ئەم سوورەتەی (بەقەرە)دا، هەرئەم دۆعایە دەکەین: (ربنا لاتؤاخذنا إن نسينا أو أخطأنا، ربناولاتحمل علينا إصرا كما حملته على الذين من قبلنا، ربنا ولاتحملنا مالا طاقة لنا به واعف عنا واغفر لنا وارحمنا أنت مولانا فانصرنا على القوم الكافرين)، پاشانیش دەڵێین: (آمين فاللهم آمين) .

*** *** ***

## ٣- سوورەتی ( ئالی عیمران )ـە مەدەنییەو ( ٢٠٠ ) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتەیش یەکێکە لەسوورەتە درێژەکانی قورئان و، باسی دووخاڵی گرنگ ئەکات، **یەکەم:** یەکخواپەرستیی ڕاستەقینەو، پەیامبەرێتیی پێغەمبەروﷺ، ڕاستیی و دروستیی قورئانی پیرۆز. **دووەم:** حەج و جیهادو سوود خواردن و زەکات نەدان و.. هتد ، باسێکی جەنگی (بەدر)و (ئوحود) دەکات، شیاوی ئاماژە بۆ کردنە، کە نزیکەی (٨٣) ئایەتی ئەم سوورەتە , ساڵی نۆیەمی کۆچی لەمەدینەدا سەبارەت بە شاندەکەی خەڵکی (نەجران) هاتن، کەپێکهاتبوو لە (٦٠) سواری هەڵبژێراوی دەمڕاسی هۆزەکەیان ، هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ تا لەبارەی (عیسا)وە قسەوباس بکەن و بەپێغەمبەری بسەلمێنن کە : گوایە عیسا (خوا)یە ! هەروەکو سوورەتی (بەقەرە) باسێکی درێژی جوولەکەکانی کرد.

جا ئابەم شێوەیە دەست پێدەکاو دەفەرمویٚ: ﴿بسم الله الرحمن الرحيم * ¹ الم﴾ واتە: قورئان هەرلەم پیتانەی: (ئەلیف، لام، میم) و، وێنەیان پێکهاتووە، جا ئەگەر ئێوە باوەڕتان پێی نیە، دەسا فەرموون وێنەی بێنن ؟ ﴿² الله لا إله إلا هو﴾ هەر (الله)یە خواو پەرستراوی ڕاستەقینەی بە هەق، بێجگە لەخۆی هیچ خواو پەرستراوێکی تر نیە، شیاوی پەرستن بێت ﴿الحی﴾ هەمیشە زیندووو، هەمیشە بووەو دەبیٚ ﴿القيوم﴾ پایەدارو چاودێری گشتکارو، ڕاگیرکاری هەموو بوونەوەرە، واتە: ئەمەیە خوای ڕاست و بەهەق, نەك عیسا خوا بیٚ وەکو عیساییەکان دەڵێن.

**سەرنجێك:** لەفەرموودەی باوەڕ پێکراودا هەیە کە: ناوە گەورەو پیرۆزەکەی خوا (ئیسمی ئەعزەم) لە (ئایەتەلکورسیی) و، لە یەکەم ئایەتی (ئالی عیمران)دایە: (الله لاإله إلا هو الحی القيوم). ﴿³ نزل عليك الكتاب

بالحق﴾ ئەم (قورئان)ـەی وردە وردەو، کەم کەم ، بە هەق وراست و دروست، دابەزاندۆتە سەرتۆ ﴿مصدقا لما بين يديه﴾ پشتگیری ئەوهەموو نامەو کتێبە پێشوانەی خۆیەتی، واتە : ددان بەو کتێبانەشدا دەنێت ، بەر لەخۆیبوون ﴿وانزل التوراة والإنجيل -
٤ من قبل هدى للناس﴾ و لەپێش ئەم قورئانەیشەوە (تەورات و ئینجیل)ـی دابەزاند، بۆ ڕێنوێنی خەڵکانی سەردەمی خۆیان ﴿وانزل الفرقان﴾ پاش ئەوانیش ئەم (قورئان)ـەی دابەزاند، بۆجیاکەرەوەی ڕاستیی و ناڕاستیی، هەق و باتڵ ﴿إن الذين كفروا بآيات الله﴾ ئەوکەسانەی کە بەبەڵگەو نیشانەکانی خوا بڕوایان نیەو کافرن, لەکاتێکدا هەمووش پڕ بەدەم هاواری بوونی خواو، تاك و تەنیایی خوا دەکەن ﴿لهم عذاب شديد﴾ بەراستیی لەدوارۆژدا سزایەکی زۆر قورس و گرانیان بۆ هەیە ﴿والله عزيز ذوانتقام﴾ خۆ دیارە کە خواش زۆر بالادەست و بەتوانایە، تۆڵە سێنەرە لەبێ باوەڕان، بەهەر شێوەیەك خۆی بیەوێ ﴿
٥ إن الله لا يخفى عليه شئ فى الأرض ولا فى السماء﴾ نە لەزەویی, نە لەئاسمان، هیچ شتێك لەخوا شاراوە نییە، ئاگاداری هەموو دەغدەغەو خەتەراتی دڵەکانیشە ﴿
٦ هو الذى يصوركم فى الأرحام كيف يشاء﴾ تەنهائەوە، بتوانێ لەمناڵدانی دایکتاندا هەرچۆنێ حەزبکا، نەخشەی سەروسیماو بیچمتان بکێشێ: یەکێ ڕەشپێس، یەکێ سپی پێس، یەکێ نێر، یەکێ مێ، یەکێ بالابەرز، یەکێ کورتە بالا، واتە: بەئارەزووی خۆی نەخشە دادەڕێژێ و گەڵاڵەی هەموو شتێ دەکات ﴿لا إله إلا هوالعزيز الحكيم﴾ جگە لەخۆی هیچ پەرستراوێکی تر نیە هەق بێت، هەرخۆیشی بالادەست و زاڵە، زۆر کارزان و کاردروستە، هەمووشتێکی لەجێگەی خۆیدایە، لە سوورەتێکی تردا لەبارەی دەسەڵات و زەبردەستی خواوە دەفەرموێ: (يخلقكم فى بطون أمهاتكم خلقا من بعد خلق فى ظلمات ثلاث..).


الجزء الثالث — سورة آل عمران

سُورَةُ آلِ عِمۡرَانَ — مدنية — آياتها ٢٠٠

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓمٓ ﴿١﴾ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُ ﴿٢﴾ نَزَّلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ مُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ وَأَنزَلَ ٱلتَّوۡرَىٰةَ وَٱلۡإِنجِيلَ ﴿٣﴾ مِن قَبۡلُ هُدٗى لِّلنَّاسِ وَأَنزَلَ ٱلۡفُرۡقَانَۗ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ لَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدٞۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٞ ذُو ٱنتِقَامٍ ﴿٤﴾ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَخۡفَىٰ عَلَيۡهِ شَيۡءٞ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِ ﴿٥﴾ هُوَ ٱلَّذِي يُصَوِّرُكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡحَامِ كَيۡفَ يَشَآءُۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٦﴾ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٞۖ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٞ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ وَٱبۡتِغَآءَ تَأۡوِيلِهِۦۖ وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلّٞ مِّنۡ عِندِ رَبِّنَاۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿٧﴾ رَبَّنَا لَا تُزِغۡ قُلُوبَنَا بَعۡدَ إِذۡ هَدَيۡتَنَا وَهَبۡ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحۡمَةًۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡوَهَّابُ ﴿٨﴾ رَبَّنَآ إِنَّكَ جَامِعُ ٱلنَّاسِ لِيَوۡمٖ لَّا رَيۡبَ فِيهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُخۡلِفُ ٱلۡمِيعَادَ ﴿٩﴾

إن الذين — ٥٠

## ئایەتە (موحکەم) و (موتەشابیە) ـە کانی قورئان:

کاتێ نوێنەری گاورەکانی (نەجران) هاتە لای پەیامبەرﷺ پێیانگوت: باشە! تۆیش سەبارەت بەعیسا، هەر وەك ئێمە ناڵێیت کە: وشەو ڕۆحی خوایە؟ مەبەستیان ئەوەبوو کە بەبیروباوەڕی ئەوان عیسا ئادەمیی نییەو خوایە ! ئینجا خوا ئەم ئایەتەی ناردو فەرمووی: ﴿
٧ هو الذى أنزل عليك الكتاب﴾ هەر ئەوخوایە ئەم کتێبە (قورئان)ـی دابەزاندە سەرت ﴿منه آيات محكمات هن أم الكتاب﴾ هەندێکی چەند ئایەتێکی (تەئویل) هەڵناگرن و ماناو مەبەستەکانیان موحکەم و ڕۆشن و دامەزراوو ماك و بناغەن بۆ ئایەتەکانی تری، واتە: نەگۆڕاون و، قابیلی دەستکاری نین و، تێنەگەیشتوان ناتوانن لەمەبەستەکانی خۆیاندا بەکاریان بێنن ﴿وأخر متشابهات﴾ وئەوی تریشی (موتەشابیە) و لێکچوون، واتە: بێژەو وشەکانی مانای جۆراوجۆر هەڵدەگرن و، بۆ هەموو کەسێکیش ڕۆشن نین، چونکە چەند واتاو مانایەکی قوڵ و، چەند مانایەکی جیا لەوی تر دەبەخشن، بەڵام خوێندەوارە زانیارەکان لەبەر ڕۆشنایی ئایەتە موحکەمەکاندا, مانای ئەمانیش دەزانن و

چارەسەریان دەکەن ﴿فأما الذين في قلوبهم زيغ﴾ ئینجا ئەوانەی لە دڵیاندا لادان و چەوتی هەیەو، هەمیشە ئامادەن بۆ فیتنەنانەوە ﴿فيتبعون ما تشابه منه﴾ هەرلە (موتەشابیه)ـەکان دەگەڕێن و، هەر لەوان پەیڕەوی ئەکەن و، بەئارەزووی خۆیان تەفسیریان ئەکەن ﴿ابتغاء الفتنة﴾ بە مەبەستی گێرە شێوێنی ولادانی خەڵکی لە ڕێگای ڕاست و خولْقاندنی گومان بۆیان ﴿وابتغاء تأويله﴾ وە یان هەرچۆنێك دڵیان حەز بکا, مانایان بکەن و، تەفسیرو لێکدانەوەی هەڵەیان بۆهەڵبەستن، بەو ناوەوە کە هەرخۆیان خەمخۆری قورئانن و دەیپارێزن! ﴿وما يعلم تأويله إلاالله﴾ لە کاتێکدا تەفسیرو لێکدانەوەی مانا ڕاستەکەیان, خوا نەبێ کەسێکی تر نایزانێ، کەوابوو ئێمە هەرتەسلیم بوون و ملکەچیمان لەسەرە، ئەوسا ئەگەر شتێکی واهەبوو، ئەبێ لە ژێر ڕووناکی ئایەتەکانی تردا تەفسیر بکرێتەوە.

**جەماوەری زانایان دەڵێن:** ئایەتی (وما يعلم تأويله إلاالله) (وەقف)ـی تەواوە، واتە: لە خوێندنەوەدا , دەبێ قورئانخوێن لەسەر بێژەی (إلاالله) دا بوەستێت، پاشان لە (والراسخون)ـەوە دەست پێ بکاتەوە، ئەمەیش ئەوە دەگەیەنێت کە بەڕاستیی تەنها هەرخوا خۆی دەزانێ مەبەست لەئایەتی (متشابه) دا چیە ؟ (تەبەریی) دەڵێت: (أرجح الأقوال: في معنى المحكم والمتشابه دون خلقه، كوقت خروج عيسى ووقت طلوع الشمس من مغربها, وقيام الساعة، وفناء الدنيا..) واتە: قسەی پەسەندو گونجاوو شیاو بۆ مانای (موحکەم وموتەشابیه) ئەوەبوو، نەك وەکو (نەسارا) و (خەوارج)ـەکان بە ئارەزووی خۆیان تەفسیری ئایەتەکانیان دەکردەوە، بۆ نموونە: لەئایەتی: (.. وروح منه ..) ١٧١/٤) نەسارا سەریان لەخۆیان شێواند و وتیان: ئەمە مانای وایە کە (عیسا) کوڕی خوایە! هەتبوو لەبەر ڕووناکی ئەم ئایەتەدا: (إن هو إلا عبد أنعمنا عليه..) وەیان ئایەتی: (إن مثل عيسى عندالله كمثل آدم خلقه من تراب ثم قال له كن فيكون) ٥٩/٣. تەفسیری ئایەتی (وروح منه ..) بکەنەوە، ئەوسا بۆیان دەردەکەوت کە عیسا خوا نییە، بەڵکو بەندەی خوایە . (خەواریج)یش لەئایەتی (.. إن الحكم إلا لله..)دا خۆیان سەر لێشێواوکرد، بەتایبەت لە ڕووداوەکەی نێوان (عەلی کوڕی ئەبی تالیب) و(موعاوییە)دا، ئەوە بوو ئیمامی (عەلی) یان کافر کرد! بەتایبەتی لەودەمەدا کە (ئەبا مووسای ئەشعەریی) کردبووە حەکەم بۆ کۆتا بڕیاری کوژاندنەوەی فیتنەو کێشەکەیان. ﴿والراسخون في العلم يقولون آمنا به﴾ ئەوانەش کە لەزانستدا ڕۆچوو و دامەزراوو زۆر زانانن دەڵێن: ئێمە باوەڕمان بە (متشابه) هەیە ﴿كل من عند ربنا﴾ هەردوو بەشەکەی قورئان (محكم ومتشابه) لەلایەن پەروەردگارمانەوەیە، پێغەمبەر ﷺ لەبارەی تێگەیشتن لەمەبەستی ئایەتەکان , دوعای بۆ (ئیبن عەباس) کردوو فەرمووی: ((اَللهم فَقِّهْهُ في الدين، وعَلِّمْهُ التَّأويل)) فتح الباری. ﴿وما يذكر إلا أولوا الألباب﴾ خۆ لەڕاستیدا تەنها خاوەن بیرو پیاوە زیرەك و دڵ وشیارەکانن , بەوردیی بیرئەکەنەوەو سوودی لێوەردەگرن و لەم حەقیقەتە تێدەگەن. پێغەمبەری خوا ئەم ئایەتەی (هوالذي أنزل عليك القرآن منه آيات محكمات هن أم الكتاب وأخر متشابهات)ـی, هەتا (وما يذكر إلا أولواالألباب) خوێندەوەو پاشان فەرمووی: ((فإذا رأيت الذين يَتَّبِعُونَ ماتَشابَه منه، فأولئك الذين سَمَّى اللهُ فاحْذَرُوهُمْ)). ﴿[8] ربنا لاتزغ قلوبنا بعد إذ هديتنا﴾ ئەو ژیرو تێگەیشتوانە دەڵێن: پەروەردگارمان! دوای ئەوەی هیدایەتت داین و ڕێنماییت کردین، دڵەکانمان لەڕێی هەقی خۆت لامەدە، هەتا بکەوینە شوێنی فیتنەخوازەکان. ﴿وهب لنا من لدنك رحمة﴾ وە لەلای خۆتەوە ڕەحمەتمان پێ ببەخشەو، دڵمان لەسەر هەق دابمەزرێنە ﴿إنك أنت الوهاب﴾ بەڕاستیی هەر ئەتۆی بەخشندە و بەخشێنەری هەرەمەزن، پێغەمبەر لەبارەی دامەزراندنی دڵەکانەوەو، لادانیان لەخوا دەخوازێ و دە فەرمووی: ((يامُقَلِّبَ القُلُوبِ ثَبِّتْ قَلْبِي على دينِكَ)) پاشان ئایەتی: (ربنا لاتزغ قلوبنا بعد إذ هديتنا وهب لنا من لدنك رحمة إنك أنت الوهاب)ی خوێندەوە. ﴿[9] ربنا إنك جامع الناس ليوم لا ريب فيه﴾ پەروەردگارمان! بەڕاستیی هەرتۆ

کۆکەرەوەی خەڵکیت "بۆپاداش وتۆڵە" بۆ ڕۆژێك کە بۆهاتنی گومانێك نیە. ﴿إن الله لا یخلف المیعاد﴾ بەراستیی خوا لـە بـەڵێن و وەعدەکانی خـۆی لانـاداو پـەیمان ناشـکێنێ. بـەڵێ .. هـەمووکات بنیادەم بەرامبـەر بـەقورئان دوو دەستەیە: بەشێکیان وەك خـۆی تەفسیری ئایەتـەکان روون ئەکەنـەوەو بـەموو لێـی لانـادەن، ئـەوی دیکـەش بـەپێی بەرژەوەندی خۆیان تەفسیری دەکەنەوە!.

## ماڵ و عەولاد بەهانا نایە ڕۆژی سەلا :

﴿[١٠] إن الذین کفروا لن تغنی عنهم أموالهم ولا أولادهم من الله شیئا﴾ بێگومـان ئەوکەسانەی کە بەپەیامبەر ﷺ بێ باوەڕو کافرن لە ڕۆژی قیامەتدا هەرگیز نەماڵیان ، نە منداڵیان لەسزای خوا بێ نیازیان ناکەن و، فریایان ناکەون هەرچەندە ئەمڕۆ خۆیانی پـێ هەڵئەکێشن و شانازیی پێوە ئەکـەن" ﴿وأولئك هم وقود النار﴾ دەشبنە سووتەمەنیی و دەستـە چیلەی ئـاگر ﴿[١١] کـداب آل فرعـون﴾ خـوو دابیـان هـەروەکو خـوو داب ونـەریتی گـەلی فیرعـەون ﴿والـذین مـن قبلـهم﴾ و ئەوانـەش لـەپێش ئەوانـە بـوون وایـە ﴿کـذبوا بآیاتنا﴾ کە گشت جاریێ ئایەتـەکانی ئێمەیان بەدرۆ دادەنا ﴿فأخـذهم الله بـذنوبهم﴾ ئینجـا خـوایش بـەهۆی گونـاح و تـاوانیی خۆیانـەوە گرتنـی و لـەناوی بـردن ﴿والله شـدید العقاب﴾ دڵنیابن خوا تۆڵەسێنێکی زۆر توندو سەختگیرە، واتـە: سـەرەنجامی قورەیشـیش هـەروەك ئەوانـە تیاچوون و دۆزەخـە، ئەوسـا سـامان ومنداڵیشـیان هـیچ کـەڵکیان پێناگەیەنن ﴿[١٢] قل للذین کفروا﴾ بێگومانبن بەوانەی کە بێ بڕوان بڵێ ﴿ستغلبون وتحشرون إلی جهنم﴾ کە بـەم زووانـە "هـــەر لـــەدونیادا" تێدەشـــکێن و ژێـــر ئەکـــەون، وە لەدوارۆژیشـدا بـەرەو دۆزەخ کۆئەکرێنـــەوەو رادەپێچـرێن "هەرچـەندە ئـەمڕۆ موسـڵمانان لـەئوحودا بەرەوالـەت تـێ شـکابن" ﴿وبـئس المهـاد﴾ کـە دۆزەخـیش جـێ خـەوێکی خراپە!

الجزء الثالث | سورة آل عمران

إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَن تُغۡنِيَ عَنۡهُمۡ أَمۡوَٰلُهُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُهُم
مِّنَ ٱللَّهِ شَيۡـًٔاۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ وَقُودُ ٱلنَّارِ ١٠ كَدَأۡبِ ءَالِ
فِرۡعَوۡنَ وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمۡۗ
وَٱللَّهُ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ١١ قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ سَتُغۡلَبُونَ
وَتُحۡشَرُونَ إِلَىٰ جَهَنَّمَۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمِهَادُ ١٢ قَدۡ كَانَ
لَكُمۡ ءَايَةٞ فِي فِئَتَيۡنِ ٱلۡتَقَتَاۖ فِئَةٞ تُقَٰتِلُ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ
وَأُخۡرَىٰ كَافِرَةٞ يَرَوۡنَهُم مِّثۡلَيۡهِمۡ رَأۡيَ ٱلۡعَيۡنِۚ وَٱللَّهُ
يُؤَيِّدُ بِنَصۡرِهِۦ مَن يَشَآءُۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبۡرَةٗ لِّأُوْلِي
ٱلۡأَبۡصَٰرِ ١٣ زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ
وَٱلۡبَنِينَ وَٱلۡقَنَٰطِيرِ ٱلۡمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلۡفِضَّةِ
وَٱلۡخَيۡلِ ٱلۡمُسَوَّمَةِ وَٱلۡأَنۡعَٰمِ وَٱلۡحَرۡثِۗ ذَٰلِكَ مَتَٰعُ
الحزب ٦ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسۡنُ ٱلۡمَـَٔابِ ١٤ ۞ قُلۡ
أَؤُنَبِّئُكُم بِخَيۡرٖ مِّن ذَٰلِكُمۡۖ لِلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ عِندَ رَبِّهِمۡ جَنَّٰتٞ
تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَأَزۡوَٰجٞ مُّطَهَّرَةٞ
وَرِضۡوَٰنٞ مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِٱلۡعِبَادِ ١٥

٥١

## هەقە لە ڕۆژی (بەدر) عیبرەت بگرن :

﴿[١٣] قد کان لکم آیة فی فئتین التقتا﴾ بەراستیی لەو دوو کۆمەڵەدا لەجەنگی (بەدر)دا ڕووبەڕووی یەکتر وەستان، دەرس و ئامۆژگارییەك هەبوو بۆ ئێوە ئەی جوولەکە ! ﴿فئـة تقـاتل فـی سـبیل الله﴾ دەستـەیەکیان بۆخـوا دەجـەنگێن ﴿وأخـری کـافرة﴾ و دەستـەکەی تریان کـافرو بـێ بڕوان و، لـەپێناوی تاغووتانـداو، دژ بـەخـوا دەجـەنگێن ﴿یـرونهم مثلیهم رأی العین﴾ بەچاوی خۆیان کۆمەڵە بڕوادارەکەیان بەدوو ئەوەندەی خۆیـان دەبینـی، ئەوسـاش خـوا ترسـی خستـە دڵیانـەوە وتێشـکان ﴿والله یؤیـد بنصـره مـن یشـاء﴾ دیـارە خـوا پشتگیری هەرکەسێك کـە خـۆی بیـەوێ و بەشیاوی بزانـێ دەکـات، بۆیـە پشـتگیری لەخـەڵکی (بـەدر) کـردو سـەری خسـتن ﴿إن فی ذلـك لعبـرة لأولی الابصـار﴾

بەراستیی لەو هاوکاریی و سەرخستنەدا لەگەڵ کەمی ئەمان و زۆری ئەواندا وانەو ئامۆژگارییەکی گەورە هەیە بۆئەوانەی بینایی خۆیان دەخەنە کارو خاوەن فامن ، کەوابوو هێزی ماددیی بۆ مرۆڤەکان هەموو شتێك نیەو، سەرکەوتنیش بە زۆریی و ژمارەو چەك و تەقەمەنی نییە، بەڵکو تەنها بەپشتیوانی و یارمەتی خوایە، ئەگەرچی پێویستە گشت رووبەروبونەوەیەك چەك وتەقەمەنی خۆی بۆئامادە بکرێ.

**بەزەرق و بەرقی ژینی دنیا چەواشە مەبن:**

﴿[١٤] زين للناس حب الشهوات﴾ حەزوو ئارەزوو ﴿من النساء﴾ بۆ ژنان ﴿والبنين﴾ بۆ کورانی زۆرو ﴿والقناطير المقنطرة من الذهب والفضة﴾ بۆ کۆماو کیسەی زێرو زیوو ﴿والخيل المسومة﴾ بۆ رەوە ئەسپی نیشاندارو پڕخاڵ ﴿والأنعام﴾ وبۆ مەڕو بزن ووشترو گاو مەزراو کشتوکاڵ، رازێنراوەتەوە بۆخەڵك ولایان شیرین کراوە، تەنانەت گەلێ جار زیانی خۆشیانی تێدایەو ملی خۆیانی بۆ دەشکێنن کەچی هەرکەمی ناکەنەوە!! ﴿ذلك متاع الحياة الدنيا﴾ دیارە ئەوانە هەموو نیعمەتی ژیانی ئەم دونیایەن و خوا بۆ مرۆڤی بەدیهێناون ﴿والله عنده حسن المآب﴾ خۆ جێگای حەوانەوەی زۆر خۆشتر و سەرەنجامی گەشەدارتر لەوانە، هەرلای خوایە، کەوابوو پێویستە ئادەمیی ئەوەندە سەرنەکاتە ناوجەرگی ئەو شتانەوەو، هەموو مەبەستێکی هەر ئەوانە بن، ئەگینا خۆ خوای دلۆڤان ئەوانەی هەر بۆ کەڵك لێوەرگرتن دروستکردووە بۆمرۆڤ ﴿[١٥] قل أؤنبئكم بخير من ذلكم﴾ بەو خەڵکە "کە چوونەتە ناوجەرگەی ئەوانەوە" بڵێ ئەی موحەممەد ﷺ ئەرێ حەز ئەکەن باشترو چاکتر لەسەرجەم ئەوانەتان پێ رابگەیەنم؟ ﴿للذين اتقوا عند ربهم جنات تجرى من تحتها الأنهار﴾ باشتر لەوانە، ئەمەیکە: بۆئەوانەی لە شیر وتاوان خۆ دەپارێزن، لای پەروەردگاریان چەندین باخاتی بەهەشتیان بۆهەیە، کە چەندان چۆمە ئاوو رووبار، لەبن دارەکانیانەوە دەڕۆن ﴿خالدين فيها﴾ و بە ژیانی ئێجگاریی وهەمیشەیی لەوێ دەبن ﴿وازواج مطهرة﴾ و چەندین هاوسەرو ژنی پاك و خاوێنیشیان بۆ هەیە ﴿ورضوان من الله﴾ بێجگە لەوانەش "هەموو" رەزامەندی خوایان پێدەگا ﴿والله بصير بالعباد﴾ بێگومان ئەو خوایە بینایە بە حاڵی بەندەکانی خۆیو چاك "ئەزانێ چی لە دڵ و دەروونیاندایە. بەڵێ خۆشیی و رابواردنی راستەقینەو تێرو تەواو هەر ئەمەیە کە خوای گەورە خۆی بەیانی کرد نەك سۆزوو ئارەزوو کردنی ئەو شتانە، بە جۆرێ ئیتر بەلاتەوە وابێت کە ئەوانە هەموو شتێك بن ﴿[١٦] الذين يقولون ربنا آمنا﴾ خۆ پارێزان ئەوانەن کە ئەڵێن: ئەی پەروەردگارمان! بێگومان ئێمە بەخۆتوو پەیامبەرانت بڕوامان هەیە ﴿فاغفر لنا ذنوبنا وقنا عذاب النار﴾ دەسا تۆیش "بەبەزیی خۆت" لە گوناهەکانمان ببورەو لەسزای ئاگریش بمانپارێزە.

**صیفات گەلێکی ئیمانداران:**

﴿[١٧] الصابرين والصادقين والقانتين والمنفقين﴾ ئیمانداران ئەمانە سیفەتیانن: خۆراگرن و شان ئەدەنە بەر فەرمانەکانی خوا، هەمیشە راست بێژو راستگۆن، بەشێوەك کەهەموو گیانیان بۆتە راستیی، ملکەچ و گوێرایەڵن، هەمووکات خەریکی نوێژو خواپەرستین، سامان بەخشن، واتە: لەهەموو پرۆژەیەکی خێردا دەستیان لەخەرجدایە ﴿والمستغفرين بالأسحار﴾ هەموو رۆژێکیش بەرەبەیان، لەخوا دەپارێنەوە لێیان خۆش بێت، واتە: بەر لەنوێژی بەیانی خەریکی شەو نوێژو، پارانەوەی لێخۆشبوونن.

**گەواهی بۆ تاك و تەنیایی خوا:**

﴿[١٨] شهدالله انه لااله إلاهو والملائكة وأولوا العلم﴾ خوا لەرێگەی دروستکراوەکانیەوە شایەتی دەدا - خۆهەر خۆی بەسە بۆ شایەتی- پاشان فریشتەو زاناکانیش شایەتی دەدەن کە: بێجگە لەخۆی هیچ پەرستراوێکی شیاوی

راستەقینە نییە ﴿قائما بالقسط﴾ گشت کاتێکیش لە نێوان بوونەوەردا، دادپەروەری راگرتووە ﴿لا إله إلا هو العزيز الحكيم﴾ دووبارە غەیرەز خۆی، هیچ پەرستراوێکی تر نییە ، بالادەست و زاڵە، کارجوان و کارزانە، بۆیە هەمیشە بەدادگەرانە لەنێو گشت بوونەوەردا ئەجوولێتەوە. بەڵێ ئەمە بۆ زانایان ئێجگار پلەو پایەیەکی گەورەیە، کە خوای گەورە "لەپاڵ خۆیی و فریشتەکانیشیدا" بۆ تاک وتەنیایی خۆی، دەیانگرێ بەشایەت، هەقە ئەوانیش هەق ڕەوو هەق بیژبن وئەم لاوئەولا نەکەن. ﴿[١٩] إن الدين عند الله الإسلام﴾ بێگومان تەنها ئەم دینی ئیسلامەیە، پەسەند وقبووڵە لای خوا، چونکە پاڵاوتەو پوختەی تەواوی ئایینە ئاسمانییەکانی ترە، بۆیە لەجێگایەکی تردا دەفەرموێ: (ومن يبتغ غير الإسلام دينا فلن يقبل منه) واتە: هەرکەسێك بەهەر دینێکی ترەوە بەرەو خوا بچێت، خوا لێی وەرناگرێ ﴿وما اختلف الذين أوتوا الكتاب﴾ ئەوانەش کە کتێب و نامەیان پێدرا واتە: جوولەکەو گاور کەلەناوخۆیاندا پێك نەهاتن و لەهەق لایاندا ﴿إلا من بعد ما جاءهم العلم﴾ هەر پاش ئەوەبوو کە بەڵگەو زانیاریی تەواویان بۆهات دەربارەی راستیی ئەو ئایینەی وا موحەممەد ﷺ هێنای ﴿بغيا بينهم﴾ ئەویش هەر لەبەر عینادیی و حەسوودییەك بوولەناویاندا هەبوو، چونکە دەیانزانی بەهاتنی دینی ئیسلام ، سەرۆکایەتی ئەوان لەکیس ئەچێت ، بۆیە لەباوەڕ هێنان بەدینی ئیسلام کلابوون و بووبە هەراو کێشەیان !! ﴿ومن يكفر بآيات الله فإن الله سريع الحساب﴾ دەسا دڵنیابن هەرکەسێك باوەڕی بەئایەت و نیشانەکانی خوا نەبێت، باچاك بزانن کە خوا لەرۆژی پرسینەوەدا، بەچەسپانی بەحیسابیان رادەگا ﴿[٢٠] فإن حاجوك فقل أسلمت وجهي لله ومن اتبعن﴾ خۆ ئەگەر دەمەقاڵێ و ململانێی سەختیان لەگەڵ کردی" سەبارەت بەعیساو هەرگوتیان خوایە تۆ لەوەڵامدا بڵێ: من خۆم و پەیرەوەکانم بەپاکی ڕوومان کردۆتە خواو تەسلیم و ملکەچی بڕیارەکانی ئەوین و، هەرخۆیشی تاك وتەنیاو بێ هاوەڵ و بێ شەریکە ﴿وقل للذين أوتوا الكتاب والأميين﴾ بەوانەش وا نامەیان پێدراوە (لەجوولەکەو لە گاور) نەزان و بێ نامەکانیش (لەهاوبەش دانەرانی قورەیش) بڵێ: ﴿أأسلمتم﴾ ئایا، دوای ئەو هەموو بەڵگانە ئێوەش "وەکو ئێمە" موسڵمان و ملکەچی خوا بوون؟ یان هەر سوورن لەسەر بێ باوەڕی خۆتان؟! ﴿فإن أسلموا﴾ جا ئەگەر ملکەچ و موسڵمان بوون، واتە: هاتنە سەردینەکەی تۆو وازیان لە یەهودییەت ونەصرانیەت هێنا ﴿فقد اهتدوا﴾ ئەوا "بە هەقیقەت" ڕێگەی بەختیارییان دۆزیوەتەوەو ڕێنما بوون ﴿وإن تولوا﴾ خۆئەگەر ڕوویان وەرگێڕا لەئیسلام و سەرپێچییان لێکردو باوەڕیان نەهێنا ﴿فإنما عليك البلاغ﴾ بێگومانبە ئەرکی تۆ تەنها هەرگەیاندنی پەیامەکەی خوایە" ئیتر لە بێ بڕوایی ئەوان تۆ هیچ زیانێکت پێناگاو بەرپرسیاریش نیت".



ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ إِنَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٦﴾ ٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلْقَٰنِتِينَ وَٱلْمُنفِقِينَ وَٱلْمُسْتَغْفِرِينَ بِٱلْأَسْحَارِ ﴿١٧﴾ شَهِدَ ٱللَّهُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَأُو۟لُوا۟ ٱلْعِلْمِ قَآئِمًۢا بِٱلْقِسْطِ ۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١٨﴾ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلْإِسْلَٰمُ ۗ وَمَا ٱخْتَلَفَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْعِلْمُ بَغْيًۢا بَيْنَهُمْ ۗ وَمَن يَكْفُرْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿١٩﴾ فَإِنْ حَآجُّوكَ فَقُلْ أَسْلَمْتُ وَجْهِىَ لِلَّهِ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِ ۗ وَقُل لِّلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْأُمِّيِّۦنَ ءَأَسْلَمْتُمْ ۚ فَإِنْ أَسْلَمُوا۟ فَقَدِ ٱهْتَدَوا۟ ۖ وَّإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ ٱلْبَلَٰغُ ۗ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴿٢٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَيَقْتُلُونَ ٱلنَّبِيِّۦنَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَيَقْتُلُونَ ٱلَّذِينَ يَأْمُرُونَ بِٱلْقِسْطِ مِنَ ٱلنَّاسِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢١﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٢٢﴾

﴿والله بصير بالعباد﴾ بێگومان خوا بەبەندەکانی شارەزاو بینایە" تۆڵەو پاداشتیان" وەك پێویست" ئەداتەوە، موسڵمان بن، یان نا.

**جوولەكە پێغەمبەران و صاڵحانی زۆریان كوشت:**

﴿[٢١] إن الذين يكفرون بآيات الله﴾ بێگومان ئەو جولەکەو گاورانە کە باوەڕیان بە ئایەت و نیشانەکانی خوا نیە ﴿ويقتلون النبيين بغير حق﴾ و پەیامبەرانیش "بە ناهەق" ئەکوژن!. (ئیبن کەسیر) ئەڵێ: جوولەکە تەنها لەنیوە ڕۆژێکدا، سێ سەد پەیامبەریان کوشت!! ﴿ويقتلون الذين يأمرون بالقسط من الناس﴾ ئەوانەیش دەکوژن، کەفەرمانی چاکەو دادپەروەران بەخەڵك دەدەن, هەر لەو دەمەدا، "بێجگە لە پەیامبەران" سەدودوازدە پیاوچاك وخواپەرستیشیان کوشت ﴿فبشرهم بعذاب أليم﴾ مژدەی سزایەکی ئێش پێگەیەنەریان پێبدە" دیارە ئەو سێ تاوانە: (بێ بڕوایی بە ئایەتەکانی خوا، کوشتنی پەیامبەران لە خوت و خۆڕایی، کوشتنی بانگبەرانی دینی ئیسلام) تۆڵەیان هەر جەزرەبەو سزایە. ﴿اولئك الذين حبطت أعمالهم في الدنيا والآخرة﴾ ئەوانەن کەلەدنیاو لەقیامەتدا کاروکردەوەکانیان بەفیڕۆیە ﴿وما لهم من ناصرين﴾ هیچ یارو یارمەتی دەرێکیشیان بۆ نییە.

<u>ڕێنمایی یەکانی ئایەتی (٢١-٢٢):</u>

١- بێ باوەڕیی و ستەم "هەریەکەیان" دەبنە هۆی تیابردنی خەڵکانی دونیاو، تووش بوونی سزای ئەولایان.

٢- کوشتنی بانگبەرانی دینی ئیسلام و، پێغەمبەران وەکو یەکن لای خوا! (ئیبن جەریر) لە (ئەبا عوبەیدە)وە دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ پرسی دەبێ چ کەسێ لە ڕۆژی قیامەتا سزای زۆر سەختی هەبێ؟ فەرمووی: ئەوکەسانە کە پێغەمبەران و، بانگبەرانی دینی خوا دەکوژن، پاشان ئایەتی: (إن الذين يكفرون بآيات الله..)ی خوێندەوە، دوایی فەرمووی: قەومی جولەکە لەماوەی تەنیا ڕۆژێکا" سەر لە بەیانییەکەی" چل وسێ پێغەمبەریان کوشت! جا (١٧٠) کەسی (بەنی ئیسرائیل)ی ڕووبەڕوویان وەستان و لۆمەوسەرزەنشتیان کردن، کەچی بۆ ئێوارەکەشی، ئەوانیشیان کوشت! ئیتر لەو ڕۆژەوە ناسراون! موشریك و هاوبەش دانەران، خوا کاروکردەوەیان بەفیڕۆدەبا، ئەوی خوا هاوکاری نەکا ، هیچ کەسێ ناتوانێ سەری بخا.

الجزء الثالث — سورة آل عمران

أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُوا نَصِيبًا مِّنَ الْكِتَابِ يُدْعَوْنَ إِلَىٰ كِتَابِ
اللَّهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ وَهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٢٣﴾
ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا لَن تَمَسَّنَا النَّارُ إِلَّا أَيَّامًا مَّعْدُودَاتٍ وَغَرَّهُمْ
فِي دِينِهِم مَّا كَانُوا يَفْتَرُونَ ﴿٢٤﴾ فَكَيْفَ إِذَا جَمَعْنَاهُمْ
لِيَوْمٍ لَّا رَيْبَ فِيهِ وَوُفِّيَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ
لَا يُظْلَمُونَ ﴿٢٥﴾ قُلِ اللَّهُمَّ مَالِكَ الْمُلْكِ تُؤْتِي الْمُلْكَ
مَن تَشَاءُ وَتَنزِعُ الْمُلْكَ مِمَّن تَشَاءُ وَتُعِزُّ مَن تَشَاءُ وَتُذِلُّ
مَن تَشَاءُ ۖ بِيَدِكَ الْخَيْرُ ۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٦﴾ تُولِجُ اللَّيْلَ
فِي النَّهَارِ وَتُولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ ۖ وَتُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ
وَتُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ ۖ وَتَرْزُقُ مَن تَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٢٧﴾
لَّا يَتَّخِذِ الْمُؤْمِنُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاءَ مِن دُونِ الْمُؤْمِنِينَ ۖ وَمَن
يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَلَيْسَ مِنَ اللَّهِ فِي شَيْءٍ إِلَّا أَن تَتَّقُوا مِنْهُمْ
تُقَاةً ۗ وَيُحَذِّرُكُمُ اللَّهُ نَفْسَهُ ۗ وَإِلَى اللَّهِ الْمَصِيرُ ﴿٢٨﴾ قُلْ
إِن تُخْفُوا مَا فِي صُدُورِكُمْ أَوْ تُبْدُوهُ يَعْلَمْهُ اللَّهُ ۗ وَيَعْلَمُ مَا فِي
السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ ۗ وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٩﴾

٥٣

**خاوەن نامەکان حوکمی خوایان قبووڵ نەبووا:**

﴿[٢٣] الم تر إلى الذين اوتوا نصيبا من الكتاب﴾ ئاخۆ ئەوانەت نەدیتووە کە بەشێکی گەورەیان لە کتێبی تەورات و ئینجیل پێدرابوو ﴿يدعون إلى كتاب الله ليحكم بينهم﴾ کە هەربانگ ئەکران بۆلای کتێب و نامەکەی خوا، واتە: (تەورات) و، (ئینجیل) هەتا ئەوکتێبە بڕیاری ڕاستەقینە بدا لەنێوانیانداو داوەرییان بکا ﴿ثم يتولى فريق منهم وهم

معرضون﴾ کەچی دەستەیەکیان روو وەردەگێڕن و پێی رازی نابن و هەر سەرپێچی دەکەن" دەبێ خوێنەوار پەیرەوی هەر لەراستیی بکات، ئەگەرچی زیانی خۆشی تیا بێت" ﴿[٢٤] ذلك بإنهم قالوا لن تمسنا النار إلا أياما معدودات﴾ ئەو کەتمانی هەقەیش لەبەر ئەوەبوو کەدەیانگوت: ئەگەر بشمانخەنە ناو دۆزەخەوە چەن رۆژی نەبێ پێمان ناچێ "مەبەستیان لەوە هەر (٤٠) رۆژە بوو کە گوێرەکەیان تیاپەرست ﴿وغرهم في دينهم ما كانوا يفترون﴾ بەو درۆیەیان بۆ ئایینی خۆیان هەڵیان بەست سەریان لەخۆیان شێواند و فریویان خوارد" ئەوە بوو وتیان: ئێمە کوڕو خۆشەویستی خواین و، باووباپیرانیشمان پەیامبەر بوونە، تکامان بۆ ئەکەن" ﴿[٢٥] فكيف إذا جمعناهم ليوم لا ريب فيه﴾ ئینجا ئەبێ ئەو رۆژە حاڵیان چلۆن بێت، کە بێگومان هەرپێش دێت وهەموویان کۆ دەکەینەوە بۆلێکۆڵینەوەو لێپرسینەوە ﴿ووفيت كل نفس ما كسبت﴾ و هەموو کەسیش بە سزاو تۆڵەی کاروکردەوەی خۆی ئەگا ﴿وهم لا يظلمون﴾ وهیچ ستەمێکیشیان لێ ناکرێ، لەتەورات وئینجیل دا باسکرابوو کە هەرکات موحەممەد ﷺ هات، دەبێ خاوەن نامەکان پەیرەوی لێبکەن، کەنکووڵی ئەو راستییەیان دەکردو دەیانگوت: شتی وانییە لەتەورات وئینجیل دا، پێیان دەگوترا: باشە! ئەوکتێبانە بێنن باپێکەوە سەیریان بکەین، بزانین وانییە! هەڵدەهاتن ودەرۆیشتن وگوێیشیان لەسزا نەبوو، چونکە دەیانگووت: ئەگەر وایشبێت، هەرچەند رۆژێکە!

**چۆن شوکرانە بژێر بین؟:**

ئینجا کاتێ پەیامبەر ﷺ فەتحی مەککەی کرد، بەڵێنی بەدەس گرتن وفەتحی ناوچەکانی (فارس) و (رۆم)یشیدا، ئەوجا دووڕووو جوولەکەکان کردیانە هەراو گوتیان: های های! موحەممەد! تۆ لە کوێ و، راستیی ئەم قسەیەت لەکوێ!! شتی وا چۆن ئەبێ ؟! مەگەر تۆ خاوەنی هەموو شتێکی و، دەسەڵات و موڵکی دنیاش هی تۆیە دیارە بەمەککەیش تێر نەبوویت ، ئەوسا خوا فەرمووی: ﴿[٢٦] قل اللهم مالك الملك﴾ بڵێ: خوایە! ئەی خاوەن هێزو دەسەڵات! ﴿تؤتي الملك من تشاء وتنزع الملك ممن تشاء﴾ هەرکەسێك خۆت بتەوێ دەسەڵات و موڵکی پی ئەدەی، هەرکەسیش خۆت بتەوێ دەسەڵات وحکوومەتی لێ دەسێنی" دەسەڵاتداری بێ سنووررو بێ مەودا هەر ئەتۆی" ﴿وتعز من تشاء وتذل من تشاء﴾ هەرکەسیش خۆت بتەوێ باڵا دەست و رێزداری ئەکەیی و، هەر کەسیش خۆت بتەوێ زەلیل وسووکی ئەکەی ﴿بيدك الخير﴾ گشت خێرو چاکەیەك هەر بەدەستی خۆتە ﴿إنك على كل شئ قدير﴾ بەراستیی تۆ بەسەر هەموو شتێکدا بەتواناو دەسەڵاتداری ﴿[٢٧] تولج الليل في النهار وتولج النهار في الليل﴾ شەو ئەبەیتە ناو رۆژ، رۆژیش ئەبەیتە ناو شەو" لەم زیاد ئەکەیت و ، لەویش کەم ئەکەیت، یا بە پێچەوانەوە" ﴿وتخرج الحي من الميت وتخرج الميت من الحي﴾ زیندوو لەمردوو دەردێنی و، مردوویش لە زیندوو دەردەخەی" گیا ئەڕوێنی لەدانە، دانەیش ئەروێنی لەگیا، وە هەروەها ﴿وترزق من تشاء بغير حساب﴾ هەرکەسیش خۆت بتەوێ بێ ژمارە رزق و رۆزی ئەدەیتی.

**موشریك و خوانەناس مەکەنە دۆس:**

(عوبادەی کوڕی صامت) یەکێك بوو لە موجاهیدەکانی بەدرو پیاوێکی زۆر صالحیش بووکاتێ پەیامبەر بۆ جەنگی خەندەق خۆی رێکخست پێی وت: ئەی پەیامبەری خوا! پێنج صەد کەس جوولەکەی هاوپەیمان و برادەرم هەیە، مۆڵەت بدە بالەگەڵ خۆم بیانهێنم بۆ ئەم جەنگە ، وهاوکاریمان بکەن ، ئەوساخوا فەرمووی: ﴿[٢٨] لا يتخذ المؤمنون الكافرين أولياء من دون المؤمنين﴾ نابێ بڕوا داران جگە لە بڕواداران کەس بگرن بەدۆست و بەیارمەتیدەروو پشت و پەنای خۆیان ﴿ومن يفعل ذلك فليس من الله في شئ﴾ هەرکەسێك لەفەرمانی خوا دەرچێ و

کافران بکاتە دۆستی خۆی، ئەوە هیچ بەشێکی پەیوەندیی ئیمانیی بەخواوە نییە. بەڵێ.. پەیوەندیی و دۆستایەتی کردن لەگەڵ کافراندا ڕەوا نییە، بەڵام پەیمانبەستن کاتێ بەرژەوەندی ئیسلامیی تیا ڕەچاوبکرێت ڕەوایە، وەك پەیامبەر لەگەڵ (خوزاعە) دا پەیمانی بەست و هاوبەشدانەرو موشریك بوون ﴿إلا أن تتقوا منهم تقاة﴾ مەگەر لێیان بترسن و، بتانەوێ لەشەڕیان خۆ قوتار بکەن و خۆ بپارێزن، ئەوە لەوکاتەدا چاك وایە بە ڕەواڵەت دوژمنایەتیی و دژایەتی نەکرێن ، بۆ پشتگیری ئەمە ئیمامی (بوخاریی) ئەم (ئەسەر)ە لەئەبوو دەرداوە دێنێ: ((إنا لنكشر في وجوه أقوام و إن قلوبنا لتلعنهم)) فتح الباری: كتاب الأدب / باب ٨٢/ص ٦١٣١. واتە: بێگومان "وەکو موسڵمانان" لەرووی خەڵکانی خراپدا، لێو بەزەردە خەنەین، بەڵام دڵمان نەعلەتیان لێدەکاو، ڕقی لێیانە. (ئیبن بەتتال) دەڵێ: پێکەوە ژیان و(مودارات) بەشێکە لەڕەوشتی موسڵمانان. هەندێ کەس (مودارات) و (مداهەنە) تێکەڵ دەکاو وادەزانێ هەردوو یەك شتە! بەڵام ڕاستییەکەی ئەمەیە کە مودارات: ڕووخۆشی وقسەی نەرم ونیانە لەرووی نەیاراندا، لەبەر دروستبوونی ئولفەت وهۆگری لەنێوان هەردوولادا! بەڵام (موداهەنە): وەکو زاناکان دەڵێن: زیندەگییە لەگەڵ (فاسیق) وپیاوخراپانداو، لەگەڵ ڕەزا بوون بەو کارەی دەیکات دیارە ئەم (موداهەنە)یە حەرامەو، (مودارات) ڕێی پێدراوە. فتح الباری. ئیبن عەباس ئەڵێ: (ليس التقية بالعمل، إنما التقية باللسان)، واتە: خۆ قوتار کردن لێیان تەنها هەر بەقسەو گووتارە، نەك بەدڵ وکاروکردەوە هاوکاری بکرێن، دیارە ئەمەش تەنیا بۆ موسڵمانانی بێ دەسەڵات وناتەواو ڕێی پێدراوە، بۆیە لەم سۆنگەیەوە دەوڵەتی ئیسلامیی دەتوانێ لەگەڵ دەوڵەتی نائیسلامییدا بەرژەوەندییەکانی خۆی گرێ بدا بەمەرجێ عەقیدەو ئایدۆلۆژی ڕۆڵەکانی وڵاتەکەی پارێزراو بێت، نەکەونە ژێر گوشاری سیاسیی و ئابورییەوەو، وردەوردە نەدزرێن ﴿ويحذركم الله نفسه﴾ خوای گەورە دەیەوێ ئێوە هەر لەزاتی خۆی بترسن و وشیاربن . بەڵێ.. گەلێ جار لەقورئان وفەرموودەدا بێژەی (نەفس) بۆ خوا بەکارهاتووە، بۆنموونە لەسوورەی (٣/٢٨)، ٦/٢٠، ٥٤/٤١، لە فەرمودەیشدا وەك: (ولذلك مدح نفسه..) بوخاریی ، وە (كتب في كتابة يكتبه على نفسه..) مسلم، ئیمامی (بەیهەقی)یش ئەڵێت: (قال الشيخ: ومعنى قول الله سبحانه وتعالى إنه نفس، أي إنه موجود ثابت غير منتف ولا معدوم) وە دەڵێت: (نەفس) بە چەند مانایەك هاتووە ، بەڵام هەر ئەمەیان بۆخوا دەگونجێت کە بڵێین: (إثبات الذات لله تعالى) ، جا بۆیە ئێمەیش لەم تەفسیرە کورتەدا وشەی (نەفس)مان بە (زات) مانا دایەوە. سەیرێکی (الأسماء والصفات)ی ئیمامی بەیهەقی- بەرگی/٢ بکە. ﴿وإلى الله المصير﴾ وە چاکیش بزانن کە چارەنووس و گەڕانەوەی هەمووشتان لەقیامەتدا تەنها بۆلای خوایە" دیارە ئیتر ئەوحەلە هیچ کەسێ ناتوانێ لەسزای ئەو بتانپارێزێ" ﴿[٢٩] قل إن تخفوا ما في صدوركم أو تبدوه يعلمه الله﴾ بڵێ ئەی پێغەمبەر ﷺ ئەوەی لەسنگ ودڵتانایە ئەگەر بیشارنەوە، یاخود ئاشکرای بکەن ودەریخەن، لای خوا چونیەکە، چونکە ئەو بەهەمووی ئەزانێ، واتە: بە هەرشێوەیەك دۆستایەتیی و هاریکاری بێ باوەران بکەن بەئاشکراو بەنهێنی لای خوا یەکسانەو ئاشکرایە ﴿ويعلم ما في السموات وما في الأرض﴾ وە هەرچیش لەئاسمانەکان ولە زەوییدایە، ئەوچاك پێی ئەزانێ و پێی ئاگادارە ﴿والله على كل شئ قدير﴾ ئەو خوایەش بەسەر هەموو شتێکدا بەتواناو دەسەڵاتدارە.

**گش کەسێ کردەوەی "خاس و خراپی" خۆی دەبینێ:**

﴿[٣٠] يوم تجد كل نفس ماعملت من خير محضرا﴾ بترسن لەو ڕۆژەی کە هەمووکەسێك هەر چاکەیەکی کردبێت! دۆسیەو پەروەندەی بۆکراوەو دەیبینێ و" پێی دڵخۆش ئەبێت " ﴿وما عملت من سوء تود لو أن بينها وبينه أمدا بعيدا﴾ هەرکارێکی خراپیشی کردبێت "دیسان دەیبینێ و ئاوات خوازە کە لەنێوان خۆیی و کارە خراپەکانیدا

مەوداو ماوەیەکی زۆر دوور ببوایەو هەرچاوی پێ نەکەوتبا ﴿**ویحذركم الله نفسه**﴾ هەر لەسزای زاتی خوای گەورە دەبێت خۆتان بپارێزن و، ئاگادار بن بەرێکوپێکی گوێرایەڵی بکەن ﴿**والله رؤوف بالعباد**﴾ و خوا هەمیشە بەرامبەر بە بەندەکانی خۆی میهرەبان و دلۆڤانە.

**ئەر خواتان خۆش دەوێ، شوێنی پێغەمبەر ﷺ کەون:**

نوێنەری گاورەکانی (نەجران) هاتنە لای پەیامبەر ﷺ سەبارەت بە(عیسا) ململانیەکی زۆریان لەگەڵ کرد: جارێ ئەیانوت خوایە! جارێکی دی ئەیان وت کوڕی خوایە! دیسانەوە دەیانگووت سیفەتێکی خوایە! بۆیە خوا فەرمووی: ﴿[٣١] **قل إن كنتم تحبون الله فاتبعوني يحببكم الله**﴾ پێیان بڵێ ئەی پێغەمبەر ﷺ ئەگەر ئێوە خواتان خۆش ئەوێ و " ئەتانەوێ لێی نزیك ببنەوە" دەبێ پەیڕەوی لەشەریعەت وبەرنامەکەی من بکەن، ئەوسا خوایش ئێوەی خۆش دەوێ ﴿**ويغفر لكم ذنوبكم**﴾ ولە هەڵەو گوناهەکانیشیان خۆش ئەبێت ﴿**والله غفور رحيم**﴾ چونکە ئەوخوایە زۆر چاوپۆشیکارو، زۆریش دلۆڤان و میهرەبانە ﴿[٣٢] **قل اطيعوا الله والرسول**﴾ بڵێ: دەبێ گوێرایەڵی خواو پەیامبەربن ﴿**فإن تولوا فإن الله لايحب الكافرين**﴾ خۆئەگەر روویان وەرگێراو گوێرایەڵ نەبوون چاك بزانن کە کافر بوون و، خوایش بێ باوەرانی خۆشناوێ ﴿[٣٣] **إن الله اصطفى آدم ونوحا وآل إبراهيم وآل عمران على العالمين**﴾ بێگومان خوا ئادەم ونوح و ئیبراهیم وخانەوادەی ئیبراهیم و، ئالی عیمران (باوکی مەریەم)ی هەڵبژاردوو رێزی دان بەسەر هاوچەرخانی خۆیانداو کردنیە پێغەمبەر، پەیامبەرایەتیش گەورەترین بەخشین و، بەرێزترین شەرەف و پایەو پلەیە ﴿[٣٤] **ذرية بعضها من بعض**﴾ هەموو زارۆ و نەوەی یەکن ولەیەکتری داکەوتون وگشت یەك خێزانن ﴿**والله سميع عليم**﴾ و خوا خۆی ژنەواو زانایە، ئەوان هەرچی بڵێن خوا ئەیبیسێ و، هەرشتێکیش لەدڵیاندا بێت، هەر پێیدەزانێ.

الجزء الثالث — سورة آل عمران

يَوْمَ تَجِدُ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ مِنْ خَيْرٍ مُّحْضَرًا وَمَا عَمِلَتْ
مِن سُوٓءٍ تَوَدُّ لَوْ أَنَّ بَيْنَهَا وَبَيْنَهُۥٓ أَمَدًۢا بَعِيدًا وَيُحَذِّرُكُمُ
ٱللَّهُ نَفْسَهُۥ وَٱللَّهُ رَءُوفٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴿٣٠﴾ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ
فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ
﴿٣١﴾ قُلْ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ
ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٣٢﴾ ۞ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰٓ ءَادَمَ وَنُوحًا وَءَالَ إِبْرَٰهِيمَ
وَءَالَ عِمْرَٰنَ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٣٣﴾ ذُرِّيَّةًۢ بَعْضُهَا مِنۢ بَعْضٍ وَٱللَّهُ
سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٣٤﴾ إِذْ قَالَتِ ٱمْرَأَتُ عِمْرَٰنَ رَبِّ إِنِّى نَذَرْتُ لَكَ
مَا فِى بَطْنِى مُحَرَّرًا فَتَقَبَّلْ مِنِّىٓ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٣٥﴾ فَلَمَّا
وَضَعَتْهَا قَالَتْ رَبِّ إِنِّى وَضَعْتُهَآ أُنثَىٰ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا وَضَعَتْ
وَلَيْسَ ٱلذَّكَرُ كَٱلْأُنثَىٰ وَإِنِّى سَمَّيْتُهَا مَرْيَمَ وَإِنِّىٓ أُعِيذُهَا بِكَ
وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿٣٦﴾ فَتَقَبَّلَهَا رَبُّهَا بِقَبُولٍ
حَسَنٍ وَأَنۢبَتَهَا نَبَاتًا حَسَنًا وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّا كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا
زَكَرِيَّا ٱلْمِحْرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزْقًا قَالَ يَٰمَرْيَمُ أَنَّىٰ لَكِ هَٰذَا
قَالَتْ هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ إِنَّ ٱللَّهَ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٣٧﴾

حزب ٦

٥٤ هنالك دعا

**لەدایکبوونی خاتوونە مەریەم:**

﴿[٣٥] **إذ قالت امرأة عمران**﴾ ئەوسات وکاتە گرنگە وەبیربێنە کە ژنەکەی عیمران وتی: ﴿**رب إني نذرت لك ما في بطني محررا**﴾ ئەی پەروەردگارم! تۆ خۆت دەزانی کە بەراستیی من بڕیارمدا کەئەومناڵەی کەوتۆتە منداڵدانمەوە نەزری تۆیکەم بۆخزمەتکردنی (بیت المقدس)، لەهەموو ئیشێ ئازادو سەربەستی کەم، بەڵێ دایکی خاتوو مەریەم پاش ئەوە کە منداڵی نەدەبوو، ئەوسا بەفەرمانی خوا دووگیان بوو، بڕیاریدا کەهەرکات لەدایکبوو پێگەیشت بیکاتە مجێوری (بیت المقدس)، چونکە بەتەمابوو خوای گەورە کوڕی بداتێ، تاخزمەتی (بیت المقدس)ی پێ بکات ﴿**فتقبل مني إنك أنت السميع العليم**﴾ جا تۆیش ئەم نەزرەم لێوەرگرە، بەراستیی تەنها ئەتۆی خوای ژنەواو بیسەرو

زانا ﴿فلما وضعتها قالت ربی إنی وضعتها انثى﴾ ئەوسا كە منداڵەكەی داناو، دیتی كچە" دیارە ئەویش بە تەمای كوڕ بوو" وتی: ئەی پەروەردگارم ! داوای لێبوردنت لێدەكەم، ئەوا من كچم بووە!! بە كەڵكی مجێوری نایەت ﴿والله اعلم بما وضعت﴾ خۆ خواش خۆی چاكتر خەبەرداره لەوەی دیویە, دەزانێ پلەی ئەو كچەی ئەو دیویە" لە زۆر كوڕان باشترو چاكترە" ﴿ولیس الذكر كالأنثى﴾ دیارە ئەوكوڕە ئەو داوای دەكرد وەك ئەم كچە نییە دیویەتی، چونكە لەم كچەدا گەورەترین موجیزە ئەبینێ ﴿وإنی سمیتها مریم﴾ حەننەی دایكی مەریم وتی: بەراستیی من ناوم ناوە مەریەم لەزمانی ئەواندا بەواتای: خواپەرستیار ﴿وإنی إعیذها بك وذریتها من الشیطان الرجیم﴾ وە من خۆیشی و زارۆكەیشم بەتۆ سپارد، تالە شەڕی شەیتانی نەفرین لێكراو پارێزراوو دووربن، واتە: هەرچەند بۆ مجێوری ناشێت، بەڵام با هەر خەریكی خواپەرستیی بێت، خوایش بیپارێزێ ﴿[٣٧] فتقبلها ربها بقبول حسن﴾ ئینجا پەروەردگاری ئەو بەشێوەیەكی زۆر جوان و پەسەند ئەو مەریەمەی لێوەرگرت هەرچەندە مناڵیش بوو ﴿وانبتها نباتا حسنا﴾ بە پەروەردەیەكی چاك وجوان پێیگەیاند چ رۆحیی و دەروونیی، چ جەستەیی ولاشەیی ﴿وكفلها زكریا﴾ زەكەریایشی كردە مامۆستاو سەرپەرست و چاودێریكاری ئەو، واتە: چووە ژێرچاودێری زەكەریاوە، چونكە پیاوێكی زۆر صالح وچاك وپاك بوو، مێردی پوریی دایكیشی بوو لەتیرو پشكدا ناوی ئەم دەرچوو بۆ چاودێریكردنی خاتوو مەریەم ﴿كلما دخل علیها زكریا المحراب وجد عندها رزقا﴾ پاشان كە مەریەم گەورە بوو هەر جارێكی زەكەریا لە حوجرەكەیدا سەری لێدەدا دەیدی جۆرە میوەو خۆراكێكی لایە لەوكات وجێگایەدا نەبوو، بۆیە بە سەرسوڕمانێكەوە ﴿قال یا مریم انى لك هذا﴾ زەكەریا دەپرسێ: ئەرێ مەریەم! تۆ ئەم میوەو رزق ورۆزییەت لەكوێ بوو؟ ﴿قالت هو من عندالله﴾ ئەویش گووتی: لەلایەن خواوە بۆم هاتووە ﴿إن الله یرزق من یشاء بغیر حساب﴾ بەراستیی خوا بە هەركەسێك بیەوێت رۆزی بدات، بێ ژمارەو بێ ماندووبوون و عەزیەتكێشان دەیداتێ. لە (بوخاریی) و(موسلیم)دا هاتووە: ((كل بنی آدم یمسه الشیطان یوم ولدته أمه إلا مریم وابنها)) واتە: هەر منداڵێ كە لەدایك ئەبێت شەیتان تێی ئەكوتێ وئەزیەتی ئەكا خاتوو مەریم وكوڕەكەی نەبێت، چونكە دایكی مەریەم دوعای بۆكردن وگوتی: (إنی أعیذها بك وذریتها من الشیطان الرجیم).



هُنَالِكَ دَعَا زَكَرِيَّا رَبَّهُۥ قَالَ رَبِّ هَبْ لِي مِن لَّدُنكَ ذُرِّيَّةً
طَيِّبَةً إِنَّكَ سَمِيعُ الدُّعَآءِ ٣٨ فَنَادَتْهُ الْمَلَٰٓئِكَةُ وَهُوَ قَآئِمٌ
يُصَلِّي فِي الْمِحْرَابِ أَنَّ اللَّهَ يُبَشِّرُكَ بِيَحْيَىٰ مُصَدِّقًۢا بِكَلِمَةٍ مِّنَ
اللَّهِ وَسَيِّدًا وَحَصُورًا وَنَبِيًّا مِّنَ الصَّٰلِحِينَ ٣٩ قَالَ رَبِّ
أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَٰمٌ وَقَدْ بَلَغَنِيَ الْكِبَرُ وَامْرَأَتِي عَاقِرٌ قَالَ
كَذَٰلِكَ اللَّهُ يَفْعَلُ مَا يَشَآءُ ٤٠ قَالَ رَبِّ اجْعَل لِّيٓ ءَايَةً
قَالَ ءَايَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ النَّاسَ ثَلَٰثَةَ أَيَّامٍ إِلَّا رَمْزًا وَاذْكُر
رَّبَّكَ كَثِيرًا وَسَبِّحْ بِالْعَشِيِّ وَالْإِبْكَٰرِ ٤١ وَإِذْ قَالَتِ
الْمَلَٰٓئِكَةُ يَٰمَرْيَمُ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَىٰكِ وَطَهَّرَكِ وَاصْطَفَىٰكِ
عَلَىٰ نِسَآءِ الْعَٰلَمِينَ ٤٢ يَٰمَرْيَمُ اقْنُتِي لِرَبِّكِ وَاسْجُدِي
وَارْكَعِي مَعَ الرَّٰكِعِينَ ٤٣ ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ الْغَيْبِ نُوحِيهِ
إِلَيْكَ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يُلْقُونَ أَقْلَٰمَهُمْ أَيُّهُمْ يَكْفُلُ
مَرْيَمَ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يَخْتَصِمُونَ ٤٤ إِذْ قَالَتِ
الْمَلَٰٓئِكَةُ يَٰمَرْيَمُ إِنَّ اللَّهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٍ مِّنْهُ اسْمُهُ الْمَسِيحُ
عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ وَجِيهًا فِي الدُّنْيَا وَالْأٓخِرَةِ وَمِنَ الْمُقَرَّبِينَ ٤٥



**زەكەریا حەزی لە منداڵێكی چاك و پاكە:**

﴿[٣٨] هنالك دعا زكریا ربه﴾ جا هەر لەوێ زەكەریا - كە ئەوهەموو لێوەشاوەیەی مەریەمەی دیت - حەزی لە منداڵ كردوبانگی لە پەروەردگاری خۆی كرد ﴿قال رب هب لی من لدنك ذریة طیبة﴾ ووتی: ئەی پەروەردگارم! لە لایەن خۆتەوە زارۆڵێكی چاك و پاكم پێ ببەخشە،" ئەو دەمە زەكەریا خۆی بە تەواوی چوڕ بوو بەساڵا و،

ژنەکەیشی پیرو نەزۆك بوو" ﴿إنك سميع الدعاء﴾ چونکە بەڕاستیی تۆ خوایەکی ژنەوای، پاڕانەوەیت ﴿[٣٩] فنادته
الملائكة﴾ ئینجا فریشتەکەی ئێمە (جوبرەئیل) بانگی لێکرد ﴿وهو قائم يصلي في المحراب﴾ کە ئەوکات لە
میحرابەکەیدا وەستابوو و نوێژی ئەکردوو" خەریکی پاڕانەوەو لاڵە بوو"لەخوا ﴿أن الله يبشرك بيحيى﴾ بانگی
لێکرد کە بەڕاستیی خوای گەورە موژدەت پێدەدا, بە یەحیا ﴿مصدقا بكلمة من الله﴾ کە ددان بەگشت بێژەو
وشەیەکی خوادا دەنیٚ ، واتە: باوەڕی بە عیسایش هەیە کە بەوجۆرە "بیٚ باب" لەدایکبووە، ﴿وسيدا وحصورا
ونبيا من الصالحين﴾ مرۆڤێکی مەزن و گەورەو ڕێزدارە لەناو گەلەکەیدا، زۆریش خۆڕاگرو دوورەپەرێزە لە
ئارەزووی نەفسیی وکاری نابەجێدا لەگەڵ تواناو قابلیەتی بەدەنیشدا وەلە ئایندەدا دەبێتە پەیامبەرو لەریزی
چاکاندایە. بێژەی (سەید) بەلای شەرعزانەکانەوە بەکەسیٚ ئەڵێن: هەڵسیٚ بەچاکسازی حاڵی خەڵك لە کاروباری
دونیاو ئاخیرەتیاندا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((أنا سيد ولد آدم ولا فخر)) ، وە یان سەبارەت بە (حەسەن)ی
کچەزای فەرمووی: ((إن ابني هذا سيد، ولعل الله يصلح به بين فئتين عظيمتين من المسلمين)) بوخاریی ٧١٠٩ /
باب-٢٠ . واتە: ئەم کوڕەم -حەسەنی کچەزام- پیاوێکی ماقووڵ وخاوەن ڕێزە، ئومێدە ببێتە مایەی ئاشتی نێوان
دوو دەستەی گەورە لە موسڵمانان. بەڵیٚ هەروایش بوو، چونکە هەرکە (عەلیی) بابی کوژرا، پتر لە (٤٠) هەزار کەس
هاتن پەیمانیان دایە، بگرە زۆرێکیش لەوانەی پەیمانیان بە بابی نەدابوو پەیمانیان بەم دا، ئەوسا نزیکەی (٧)
مانگێك لە عێراق و خۆراسان مایەوە، بەڵام کاتیٚ لەگەڵ دەستەو بەستەی (موعاویە)دا -خوا لێی ڕازی بێت-
خەریکبوو تێکبچن لە (ئەنبار)ی عێراقدا، ئیمامی حەسەن -خوا لێی ڕازی بێت- ئەو شەڕو شۆڕەی زۆر
پێناخۆشبوو، وە زۆر دەترسا لە ڕشتنی خوێنی موسڵمانان لە هەردوولا، بۆیە لەگەڵ موعاویەدا -لەسەر چەند
مەرجێك- پێکهاتن و فتیلەی جەنگەکەی کوژانەوەو، بوو بەهۆی ئاشتی نێوان هەردوولا، کەوابوو ڕاستە (سەیید)
بوو، دیندۆست بوو خۆنەویست و دونیا نەویست بوو ﴿قال رب أنى يكون لي غلام﴾ زەکەریا بەسەر سوڕمانێکەوە
وتی: ئەی پەروەردگارم! جا چۆن من کوڕم دەبێت ﴿وقد بلغني الكبر وامرأتي عاقر﴾ من وا پیر بووم و ژنەکەیشم
نەزۆکە؟! سەرسوڕمانەکەی زەکەریا لەوەبوو کە منداڵ بوون لەتەمەنێکی ئاوادا لە یاسای باوونەریتەوە دوورە ﴿قال
كذلك الله يفعل ما يشاء﴾ گوتی: خوا هەرچی ئارەزوو بکات وادەکا، ئەم کارەی تۆیش براوەتەوەو هەردەبیٚ ﴿[٤١]
قال رب اجعل لي آية﴾ ئەوجا زەکەریا" بۆئەوەی پتر دڵنیاو دڵخۆش بێت" وتی: ئەی پەروەردگارم! خۆت
نیشانەیەکم بۆدیاریکە، بەڵگە بێت لەسەر بوونی منداڵەکە ﴿قال آيتك ألا تكلم الناس ثلاثة أيام إلا رمزا﴾ خوایش
فەرمووی: نیشانەکەت ئەوەبیٚ کەتا سیٚ ڕۆژو سیٚ شەو، تۆ ناتوانیت لەگەڵ مەردمدا قسەیە بکەیت، مەگەر بە هێما
و ئاماژە" بەسەر ، یان بەدەست, کە لەگەڵ ئەوەشدا نەخۆش نیت"هەتا بگوتریٚ: نەخۆشی ڕیٚ پێنادات قسە بکات
﴿واذكر ربك كثيرا﴾ لەو ماوەیەشدا یادی پەروەردگارت زۆر بکە ﴿وسبح بالعشي والإبكار﴾ و لە دەمە دەمەی
ئێواران و بەیانیاندا پەروەردگاری خۆت پاك و بێخەوش ڕاگرە" ناوی زۆر بێنەو، لە تەسبیحاتیشی کلا مەبە،" بۆ
زیاتر ئاشنا بوون بەم داستانەی (زەکەریا) سلاوی لەسەربیٚ بچۆ بۆ سەرەتای سوورەتی (مەریەم).

**مەریەم خاتوون لەژنانی دنیا لەبان ترە:**

﴿[٤٢] وإذ قالت الملائكة يا مريم إن الله اصطفاك﴾ ئەوکاتەش وەبیربێنە کە فریشتەکان -جبریل- بەفەرمانی خوا
- بەمریەمی گووت! بەڕاستیی خوا تۆی دەستنیشانکرد بۆ کارێکی زۆرگرنگ، واتە: هەندیٚ خەصڵەتی پێداوی کە
بە ئافرەتانی دونیای نەداوە" ﴿وطهرك واصطفاك على نساء العالمين﴾ پاکو خاوێنی ڕاگرتی" لە هەموو کارێکی

ناپەسەندەوە دووریت، هەڵیبژاردیت و بەرزی کردیتەوە بەسەر هەموو ژنانی جیهاندا" ﴿٤٣ یا مریم اقنتی لربك﴾ دەسا مەریەم! تۆیش -لەبەرامبەر ئەوەوە- یەکلابە بۆ پەروەردگارت و، ملکەچ و خۆ بەکەمزانبە. ﴿واسجدی وارکعی مع الرکعین﴾ سوجدەو کڕنووش لەگەڵ رکوع بەراندا ببە، واتە: لەگەڵ نوێژکاراندا نوێژ بکەو لەگەڵیان بە
﴿٤٤ ذلك من انباء الغیب نوحیه إلیك﴾ ئەو باسەی" مەریەم و زەکەریایە" لەو هەواڵە شاراوەو نادیارەیە کە تۆ ئاگات لێنەبوو ئێمە بە وەحی پێت رادەگەیەنین" ئەگینا هەرگیز تۆ نەتئەزانی" ﴿وما کنت لدیهم إذ یلقون اقلامهم ایهم یکفل مریم﴾ ئەوکاتەیش ئەوان قەڵەمەکانیان دەهاویشتە" ناو دەریای ئوردونەوە" هەتا بزانن کامیان سەرپەرستی و چاودێری مەریەمی بۆدەبێت، تۆ لەلایاندا نەبوویت " دیارە لەناوخۆیاندا لەسەر چاودێری کردنی مەریەم، هەر کەسە بۆخۆی دەیویست شەرەفی بەخێوکردنی مەریەمی پێ بڕێ! سەرئەنجام دەستوورێکی خۆیانیان بەکارهێنا- وەك تیروپشك هاویشتن" دەرەنجام بۆ زەکەریا دەرچوو و (خاتوونە مەریەم) درایە دەستی ئەو ﴿وما کنت لدیهم إذ یختصمون﴾ وە ئەوکاتەش کە دەمەقاڵێ و هەرایشیان بوو لەلایان نەبوویت، کەواتە: هەموو ئەمانە خوای باڵادەست پێیگوتویت و، مانای وایە تۆ پێغەمبەریت.

**مەریەم خاتوون بە عیسا مزگێنی دەدرێتێ:**

﴿٤٥ إذ قالت الملائکة یا مریم إن الله یبشرك بکلمة منه﴾ لەوێ نەبوویت کە مەلائیکە (جبریل) بە مەریەمیان گوت: بەڕاستیی خوا موژدەی کارێکی سەمەرەت پێدەدات، کوڕێکت ئەداتێ بێ باوك، وهۆو ئەسبابی منداڵبوون، بەڵکو تەنها بەفەرمانی ببە، ئەویش دەبێت: (کن فیکون) ﴿اسمه المسیح عیسی ابن مریم﴾ ناوی عیسای کوڕی مەریەمەو، نازناوی مەسیحە. (مەسیح) لە زوبانی ئەواندا نازناوێکی پیرۆزە، وەك لەزمانی عەرەبدا دەڵێیت: صدیق، فاروق.. ﴿وجیها فی الدنیا والآخرة﴾ لەدونیاو قیامەتدا پیاوماقوڵ وبەڕێزە ﴿ومن المقربین﴾ یەکێکیشە لەنزیکەکانی خوا ﴿٤٦ ویکلم الناس فی المهد وکهلا﴾ لە بێشکەدا و بەگەورەییش لەگەڵ خەڵکدا قسەی سەیرو سەمەرە دەکا. ﴿ومن الصالحین﴾ یەکێکیشە لەپیاوچاکان ﴿٤٧ قالت رب انی یکون لی ولد ولم یمسسنی بشر﴾ ئەوسا خاتوون مەریەم وتی: ئەی پەروەردگارم! جا من چۆن کوڕم دەبێ، خۆتا ئێستا هیچ مرۆیەك توخنم نەکەوتووە! ﴿قال کذلك﴾ جوبرەئیل وتی: فەرمانی خوایەو، هەروادەبێ ﴿الله یخلق مایشاء﴾ خوا حەزی لەهەرشتێك بێ دروستی ئەکات، بۆی هەیە بێ باوك منداڵ بخاتە منداڵدانەوە، دەشتوانێ بێ باوك ودایك مرۆڤ بەدی بێنێت وەکو ئادەم ﴿إذا قضی امرا فإنما یقول له کن فیکون﴾ چونکە هەر کەویستی بڕیاری شتێك بدا، تەنها هەر ئەوەندە پێی دەفەرموێ: ببە! ئەویش دەستبەجێ: دەبێ.



وَيُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِي ٱلْمَهْدِ وَكَهْلًا وَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٤٦﴾
قَالَتْ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي وَلَدٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ قَالَ كَذَٰلِكِ
ٱللَّهُ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ إِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٤٧﴾
وَيُعَلِّمُهُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ ﴿٤٨﴾
وَرَسُولًا إِلَىٰ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَنِّي قَدْ جِئْتُكُم بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ
أَنِّيٓ أَخْلُقُ لَكُم مِّنَ ٱلطِّينِ كَهَيْـَٔةِ ٱلطَّيْرِ فَأَنفُخُ فِيهِ
فَيَكُونُ طَيْرًۢا بِإِذْنِ ٱللَّهِ وَأُبْرِئُ ٱلْأَكْمَهَ وَٱلْأَبْرَصَ
وَأُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰ بِإِذْنِ ٱللَّهِ وَأُنَبِّئُكُم بِمَا تَأْكُلُونَ وَمَا تَدَّخِرُونَ
فِي بُيُوتِكُمْ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٤٩﴾
وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَلِأُحِلَّ لَكُم
بَعْضَ ٱلَّذِي حُرِّمَ عَلَيْكُمْ وَجِئْتُكُم بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ
فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿٥٠﴾ إِنَّ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمْ فَٱعْبُدُوهُ
هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٥١﴾ ۞ فَلَمَّآ أَحَسَّ عِيسَىٰ مِنْهُمُ
ٱلْكُفْرَ قَالَ مَنْ أَنصَارِيٓ إِلَى ٱللَّهِ قَالَ ٱلْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ
أَنصَارُ ٱللَّهِ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَٱشْهَدْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴿٥٢﴾

## قەدرو پلەی عیساو پەسنەکانی:

﴿[٤٨] ویعلمه الکتاب والحکمة والتوراة والإنجیل﴾ هەر بۆخۆشی -ئەو کوڕەی تۆ- شارەزای نووسین و خوێندنەوەی و حیکمەت و کارجوانیی و کاردروستیی و تەورات و ئینجیل ئەکات ﴿[٤٩] ورسولا إلی بنی إسرائیل﴾ دەشیکا بەپێغەمبەرێك بۆلای نەوەکانی یەعقوب، پێیان دەڵێ: من پێغەمبەرێکم بۆلای ئێوە رەوانە کراوم ﴿انی قد جئتکم بآیة من ربکم﴾ لەلایەن پەروەردگارتانەوە بە نیشانەو بەڵگەیەکەوە هاتووم بۆلاتان ﴿انی أخلق لکم من الطین کهیئة الطیر﴾ هەر لە قوڕ شکڵی پەلەوەر ساز ئەکەم ﴿فأنفخ فیه فیکون طیرا بإذن الله﴾ فووی پیا ئەکەم و، بەئیزنی خوا خێرا ئەبێتە پەلەوەرێکی زیندوو تاببێتە هۆی بڕوا هێنانتان ﴿و ابرئ الأکمه والأبرص﴾ جگە لەوە کوێری زگماك و پێست بەڵەکاوی چار ئەکەم ﴿واحیی الموتی بإذن الله﴾ وە مردووان زیندوو ئەکەمەوە بەئیزنی خوا (ئیبنی کەسیر) ئەڵێ: شکڵی پەلەوەری ساز کردو کەوتە گەردش و جموجوڵ (قورتوبی)یش ئەڵێ: چوار کەسیشی زیندوو کردەوە" ﴿وانبئکم بما تأکلون وما تدخرون فی بیوتکم﴾ هەرچیش لەماڵەوەتان دەخۆن و هەرچیش تێیدا دەهێڵنەوە پێتان دەڵێم و لێتانی ئاگادار ئەکەم ﴿إن فی ذلك لآیة لکم إن کنتم مؤمنین﴾ بەراستیی ئەوە بەڵگەو موجیزەن بۆتان ئەگەر راست بکەن ئەڵێن: بڕوامان بە نیشانەکانی خوا هەیە ﴿[٥٠] ومصدقا لمابین یدي من التوراة﴾ بەو تەوراتەی بەرلە خۆم بووە بە باوەڕم و دەیسەلمێنم ﴿ولأحل لکم بعض الذي حرم علیکم﴾ بەئەرکی خۆمی دەزانم هەندێ شت کە لەسەرتان یاساغ بووە لە تەوراتدا" ئێستا من- بەفەرمانی خوا بۆتان حەڵاڵ کەم " ﴿وجئتکم بآیة من ربکم﴾ بەڵگەیەکی ترم بۆ راستیی خۆم لەلایەن پەروەردگارتانەوە هێناوە بۆتان ﴿فاتقوا الله واطیعون﴾ دەسا ئێوەش هەر لەخوا بترسن و بڕوا بەوبەڵگانە بێنن و، فەرمانم بە جێ بێنن "کاتێ بانگتان ئەکەم بۆ خواپەرستیی" ﴿[٥١] إن الله ربی وربکم فاعبدوه﴾ بێگومانبن پەروەردگاری من و پەروەردگاری ئێوە هەر ئەوخوایەیە منی بەو شێوە دروستکرد، کەوابوو هەرئەو بپەرستن ﴿هذا صراط مستقیم﴾ ئەمە رێگەی راست و دروستە من بۆ ئێوەم باسکرد، دەئێوەیش دەستی لێ بەرمەدەن.

## حەواری یەکانی عیسا ﷺ:

﴿[٥٢] فلما أحس عیسی منهم الکفر﴾ ئینجا هەرکە عیسا هەستی کرد ئەوانە باوەڕی پێناکەن " پاش ئەو هەموو موجیزانە ﴿قال من انصاری إلی الله﴾ وتی: کێ بێ لەبەر خوا یارو یاوەرم بێ وپێکەوە بەرەوانی لەدینەکەی بکەین؟ ﴿قال الحواریون نحن انصار الله﴾ شاگردە دڵسۆز وپاڵاوتەکانی وتیان: هەر خۆمانین لەبەر ئایینی خوا یاریدەدەرین، بە تەنیا ئامادەین خۆبەخت کەین بۆخوا ﴿آمنا بالله واشهد بأنا مسلمون﴾ باوەڕی دامەزراومان بەخوا هێناوە، تۆیش شایەتبە عیسا! کە: بەراستیی ئێمە موسڵمان و ملکەچی فەرمانی خواین ﴿[٥٣] ربنا آمنا بما انزلت﴾ ئەی پەروەردگارمان! بەو بەڵگەو نیشانانە بۆت ناردین بڕوامان کرد ﴿واتبعنا الرسول﴾ لە پەیامبەرەکەشت (عیسا) پەیڕەویمان کرد ﴿فاکتبنا مع الشاهدین﴾ دەسا تۆش لەگەڵ ئەوانەدا بماننووسە شایەتی یەکتایی خواو راستیی پەیامبەرەکەتن ﴿[٥٤] ومکروا ومکرالله﴾ لەولایشەوە دوژمنانی دینی خوا فێڵیان کرد بۆکوشتنی عیسا! بەڵام خوا فروفێڵەکەیانی پوچەڵ کردەوەو، بەربوونە گیانی ئەوکەسە ناردبوویان بۆ کوشتنی عیساو ئەویان کوشت ﴿والله خیر الماکرین﴾ بێگومانبن خوا باشتر چارەکارە بۆهەڵوەشانەوەی فێڵ و پیلانەکانیان.

## خوا عیسای بردووە بۆ خۆی:

﴿[٥٥] إذ قال الله يا عيسى إني متوفيك﴾ ئەوەبوو فەرمووی: ئەی عیسا! بەڕاستیی من دەتبەمەوە بۆلای خۆم و، هەتا ڕۆژێ ئەتگەیەنمە کاتی دیارییکراوی ئاسایی بۆ ژیانت دەمێنی و، ئەوسا ئەتمرێنم، واتە: ئێستا بەر لەهاتنی کۆتایی ژیانت ناهێڵم ئەوانە بتکوژن و بمریت ﴿ورافعك إلي﴾ ولەلای خۆیشم جێی بەرزت دەبێو، سەرت دەخەم بۆ ئاسمان بۆلای خۆم.

زانایان لە شێوەی بەرزکردنەوەی عیسادا دوو قسەیان هەیە: یەکەم/ دەڵێن: لەم ئایەتەدا پاش و پێش هەیەو، لە بنەڕەتدا بەم جۆرەیە: (إنی رافعك إلی ومتوفيك) واتە: لەپێشدا بەرزت ئەکەمەوە بۆلای خۆم، ئەوساکە هاتیتە خوارەوە ئەتمرێنم. دووەم/ دەڵێن: ئایەتەکە هیچ ئاڵوگۆڕێکی تێدا نییەو، هەروەك ئێستایەو، ماناشی ئەوەیە کە ئەتمرێنم، ئەوجا بەرزت ئەکەمەوە بۆلای خۆم. (سەید قوتب) ئەڵێ: عیسا چۆن مردوو، چۆن بەرزبوویەوە ؟؟ ئەم جۆرەشتانە لەکارە (غەیبیات) ونادیارەکانن، هەرچەند (تەبەریی) ئەڵێت: مەبەست ئەوەیە کەخوا عیسای بەزیندوویی بۆلای خۆی بەرزکردۆتەوە، چونکە ئەو فەرمودانەیش کە یەکدەنگن بۆگەڕانەوەو هاتنەوەی عیسا لەئاخر زەماندا بۆسەر زەویی، گشت (متواتر)ن ، جاهەر بۆ پتر زانیاریی لەبارەی (عیسا)وە دەڵێم: عەقیدەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت ئەوەیە کە: (عیسا) هەر بەزیندوویی "بەفەرمانی خوا" بەرزکراوەتەوە بۆئاسمان بۆلای خۆی، جا بۆدوایی "پێشهاتنی ڕۆژی قیامەت" دێتە خوارێ و، بەشەریعەتی محمد ﷺ حوکم وبڕیار دەداو کاردەکا، پاشان دەجال دەکوژێ و ڕووی سەر زەویی پڕ دەبێ لە دادو عەدالەت و فەڕو بەرەکەت، ئیتر لەگەڵ (الطائفة المنصورة)دا کە لەپێناوی حەقدا دەجەنگێن جیهادی خۆی دەکاو لەپشت سەر ئەمیرەکەیانەوە نوێژ دەکا، ئەمەیە کورتەی ڕاو بۆچوونمان لەم مەسەلەدا ئیتر خوای گەورەش باشتر دەزانێ ﴿ومطهرك من الذين كفروا﴾ وە لەبەدکاری ئەوانە کەباوەڕیان نەهێناوە پاکت دەکەمەوە، واتە: ڕزگارت دەبێ وناهێڵم زیانت پێبگەیەنن ﴿وجاعل الذين اتبعوك فوق الذين كفروا إلى يوم القيامة﴾ وە ئەوانەش وا شوێنکەوتەی تۆبوون و خاوەنی باوەڕ بوون، تا ڕۆژی قیامەت ئەگەر بەڕاستیی لێی بنەون زاڵیان ئەکەم بەسەر بێ باوەڕان و دوژمنانیاندا ﴿ثم إلى مرجعكم فأحكم بينكم فيما كنتم فيه تختلفون﴾ لەپاشان گشتتان هەر بۆلای خۆم دێنەوە، ئینجا منیش بەڕاست ودروست گێرەو کێشەی نێوانتان سەبارەت بەکاروباری عیسا بە دادپەروەرانە دەبڕمەوە ﴿[٥٦] فأما الذين كفروا فأعذبهم عذابا شديدا فى الدنياوالآخرة﴾ ئەوکەسانەش باوەڕ یان پێ نەهیناوی، لە هەردوو جیهاندا بەتوندی سزای قورس وسەختتان ئەدەم ﴿وما لهم من ناصرين﴾ و هیچ یارمەتیدەرێکیشیان بەهانا نایە ﴿[٥٧] واما

سُورَةُ آل عِمرَان | الجزء الثالث

رَبَّنَآ ءَامَنَّا بِمَآ أَنزَلْتَ وَٱتَّبَعْنَا ٱلرَّسُولَ فَٱكْتُبْنَا مَعَ
ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٥٣﴾ وَمَكَرُوا۟ وَمَكَرَ ٱللَّهُ ۖ وَٱللَّهُ خَيْرُ
ٱلْمَٰكِرِينَ ﴿٥٤﴾ إِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَىٰٓ إِنِّى مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ
إِلَىَّ وَمُطَهِّرُكَ مِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَجَاعِلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوكَ
فَوْقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ ۖ ثُمَّ إِلَىَّ مَرْجِعُكُمْ
فَأَحْكُمُ بَيْنَكُمْ فِيمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿٥٥﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ
كَفَرُوا۟ فَأُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ وَمَا
لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٥٦﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟
ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَيُوَفِّيهِمْ أُجُورَهُمْ ۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٧﴾
ذَٰلِكَ نَتْلُوهُ عَلَيْكَ مِنَ ٱلْءَايَٰتِ وَٱلذِّكْرِ ٱلْحَكِيمِ ﴿٥٨﴾ إِنَّ
مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَ ۖ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ
لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٥٩﴾ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴿٦٠﴾
فَمَنْ حَآجَّكَ فِيهِ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ فَقُلْ تَعَالَوْا۟ نَدْعُ
أَبْنَآءَنَا وَأَبْنَآءَكُمْ وَنِسَآءَنَا وَنِسَآءَكُمْ وَأَنفُسَنَا وَأَنفُسَكُمْ
ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَل لَّعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٦١﴾

٥٧

الذین آمنوا و عملوا الصالحات فیوفیهم أجورهم﴾ ئەوانەش کە باوەڕیان هێناوەو کارەچاکەکانیان ئەنجام داوە، خوای گەورە بەتەواوی پاداشتی شیاوی خۆیانیان دەداتەوە ﴿والله لایحب الظالمین﴾ خۆبەڕاستیی خواش ستەمکارانی خۆش ناوێ، ئیتر چۆن ستەم لەبەندەکانی خۆی ئەکات، ئیبن کەسیر دەڵێت: کەخوا (مەسیح)ـی گەیاندە لای خۆی، هاوەڵەکانی بەش بەش بوون، هەیان بوو باوەری بەخوا هەبوو دەیشی گووت: عیسا بەندەی خوێەو، کوری خاتوو مەرەیەمە، هەیشیانبوو دەیگوت: کوڕی خوایە! هەیشیانبوو دەیگوت: خوایە! نزیکەی (٣٠٠) ساڵێك بەو عەقیدە شڕو وڕەیانەوە مانەوە، ئینجا (قوستەنتین)ـی پاشای (یۆنان) بووبە عیسایی و، بەئارەزووی خۆی دەسکاری دینەکەی کرد، گۆشتی بەرازی بۆ حەلاڵ کردن و، لەنوێژدا رووی پێکردنە خۆرهەلات.. هتد، لە رۆژووەکەیاندا، دە رۆژی بۆ زیادکردن ﴿٥٨ ذلك نتلوه علیك من الآیات والذکر الحکیم﴾ ئەو هەوالأنەی کە بۆ تۆی ئەخوێنینەوە لەئایەتەکانی قورئانن و رێنیشاندەرن و، پڕبەپڕ هەقیان پێکاوە دەربارەی عیسا: (ذلك عیسی ابن مریم قول الحق الذی فیه یمترون) مەریەم / ٣٤.

**نەقلی (ئادەم) و (عیسا) لەیەك دەچێ:**

﴿٥٩ إن مثل عیسی عندالله کمثل آدم﴾ بەڕاستیی مەسەل و نمونەی دروستبوونی عیسایش "کەجێگەی سەرسوڕمانی ئەوانەیە بووەتە جێگەی مشت ومریان" هەروەکوو مەسەل و نموونەی دروستبوونی ئادەمە لەلای خو ﴿خلقه من تراب﴾ ئەوەبوو هەر لە گڵ قاڵبی بۆ ڕشت و، بیچمەکەی دروستکرد ﴿ثم قال له کن فیکون﴾ پاشان پێیگوت: ببە! خێرا ئەویش بوو، کەوابوو حاڵی عیسا سەرسوڕهێنەرتر نییە لەحاڵی ئادەم، چونکە عیسا ئەگەرچی دایکی هەبوو، بەلأم خۆ ئادەم نە باوکی هەبوو ، نەدایك، بەڵکو لە گڵ فەراهەمی هێنا، دەسا ئیتر ئەوهەموو مشت ومڕەتان لەچییە؟ ﴿٦٠ الحق من ربك﴾ سەبارەت بەعیسا قسەی راست هەرئەمە بوو پەروەردگارت بۆتی باسکرد ﴿فلا تکن من الممترین﴾ دەسا تۆیش لە گوماندارلن خۆت وە دوورخەو، بەرامبەر بەدەسەلأتی من بۆچوونەکانت نەگۆڕێت.

**گش دەزانن خوا تاك و تەنیایە :**

﴿٦١ فمن حاجك فیه من بعد ما جاءك من العلم﴾ ئینجا دوای ئەو هەموو زانین و ڕاستیانە "کە لەبارەی عیساوە" هاتە لات ، کەسێ ویستی قڕەقرت لەگەڵ بکاو کێشەت بۆ بنێتەوە ﴿فقل تعالوا ندع أبناءنا وأبناءکم ونساءنا ونساءکم و أنفسنا وأنفسکم﴾ ئەی پێغەمبەر! پێیان بڵێ: ئەگەر راست دەکەن، دەسا وەرن با گشت پێکەوە, بانگی کوڕان و ژنانمان بکەین و لەجێگایەکدا کۆببینەوە, جا بۆ سبەینێ پێغەمبەر ﷺ (حەسەن) و(حوسەین) و(فاتیمە)ی کچی، لەماڵ بردە دەرێ و پێی فەرموون: ((إن أنا دعوتُ فأمّنوا)) هەرکە من دوعاو نزامکرد، ئێوەیش (ئامین) بکەن. ﴿ثم نبتهل فنجعل لعنة الله علی الکاذبین﴾ ئەوجا پێکەوە دەسکەینە دوعاو نزاو لەعنەت ونەفرینی خوا بکەین لەوانەی درۆزنن. پێشەوا ئەحمەد"خوای لێی رازی بێت" فەرموودەیەك ئەهێنێ دەڵێ: ((لوخرج الذین یباهلون رسول الله ﷺ لرجعوا لا یجدون أهلا ولا مالا))، واتە: ئەوانەی وا "موباهەلە"یان لەتەك پێغەمبەر ﷺ دەکرد، ئەگەر دەر چوونایەو ئامادەبوونایە بۆ (موباهەلە)کە، ئەوکات لەسەر ماڵو حاڵی وێران دەگەڕانەوە. ﴿٦٢ إن هذا لهو القصص الحق﴾ بەراستی ئەوەی بۆمان گێڕایتەوە "دەربارەی عیساو دایکی" راستییەکەی هەر ئەمەیەو بەهیچ شێوەیەك گومانی تێدا نییە ﴿وما من إله إلاالله﴾ هیچ پەرستراوێکی هەق, جگە لەخوا نییەو نابێ بپەرسترێ، چونکە غەیرەز خۆی کەسی دی نییە شیاوی پەرستن بێ ﴿وإن الله لهو العزیز الحکیم﴾ وە بەڕاستیی هەرئەویشە

دەسەلأتدارو بالأدەست وکارجوان ﴿٦٣ فإن تولوا فإن الله عليم بالمفسدين﴾ ئینجا ئەگەر لەگەلْ ئەوەمەوو بەلْگانەدا هێمان ڕوویان لەهەق وەرگێراو کلابوون، لێیان گەڕێ, چونکە خوا بەحالْی بەدکاران زانایە، بۆخۆیشی تۆلْە لەگشتیان دەسێنێ, هەرکەسێك بەپێی شیاوی خۆی.

ڕینماییەکانی ئایەتی (٥٩-٦٣):

١- خوا هەمووکاتێ پشتیوانی لەپێغەمبەری خۆی ئەکا.

٢- شێوەی دەمکوتکردنی کافرانی نیشاندا.

٣- موباهەلە "کە بریتییە لە نەفرین لەیەکتر کردن" لەدینی خوادا ڕێی پێدراوە، بەلأم دەبێ صالْحان و دین کاملأن بیکەن.

الجزء الثالث — سورة آل عمران

إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْقَصَصُ ٱلْحَقُّ ۚ وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّا ٱللَّهُ ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٦٢﴾ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٦٣﴾ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍۭ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِۦ شَيْـًٔا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَقُولُوا۟ ٱشْهَدُوا۟ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴿٦٤﴾ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لِمَ تُحَآجُّونَ فِىٓ إِبْرَٰهِيمَ وَمَآ أُنزِلَتِ ٱلتَّوْرَىٰةُ وَٱلْإِنجِيلُ إِلَّا مِنۢ بَعْدِهِۦٓ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٦٥﴾ هَٰٓأَنتُمْ هَٰٓؤُلَآءِ حَٰجَجْتُمْ فِيمَا لَكُم بِهِۦ عِلْمٌ فَلِمَ تُحَآجُّونَ فِيمَا لَيْسَ لَكُم بِهِۦ عِلْمٌ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٦٦﴾ مَا كَانَ إِبْرَٰهِيمُ يَهُودِيًّا وَلَا نَصْرَانِيًّا وَلَٰكِن كَانَ حَنِيفًا مُّسْلِمًا وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٦٧﴾ إِنَّ أَوْلَى ٱلنَّاسِ بِإِبْرَٰهِيمَ لَلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ وَهَٰذَا ٱلنَّبِىُّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ۗ وَٱللَّهُ وَلِىُّ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٦٨﴾ وَدَّت طَّآئِفَةٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَوْ يُضِلُّونَكُمْ وَمَا يُضِلُّونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴿٦٩﴾ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لِمَ تَكْفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَأَنتُمْ تَشْهَدُونَ ﴿٧٠﴾

يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ — ٥٨

٤- خوای گەورە تاكو تەنیا و بێ شەریکە.

٥- هەڕەشەی خوا لەموشریکان وسەرپێچی کەران لەفەرمانی خوا.

﴿٦٤ قل يا أهل الكتاب﴾ ئەی پێغەمبەر! ﷺ بەخاوەن نامەکان بلْێ: ﴿تعالوا إلى كلمة سواء بيننا وبينكم﴾ وەرن با ئێمەو ئێوە لەسەر وشەو بەرنامەیەك سووربین کە بۆ هەردوولامان چوونیەکەو یەکسانەو، پەیامبەرانیش هەموو هاودەنگ بوون لەسەری و، واز لەو تەفرەقەیە بێنن ﴿الا نعبد إلا الله ولا نشرك به شيئا﴾ وەرن باجگە لەخوا کەسێکی تر نەپەرستین و، هیچ شتێکیش نەکەینە شەریك وهاوبەشی ﴿ولا يتخذ بعضنا بعضا أربابا من دون الله﴾ هەندێکیشمان لەباتی خوا نەکەینە خواو بپەرسترێن، واتە: لەنافەرمانی خوا گوێ بیستی یەکدی نەبین، جوولەکە عوزەیریان بەخوا دادەناو، گاورەکانیش عیسا! ﴿فإن تولوا فقولوا اشهدوا بأنا مسلمون﴾ ئینجا ئەگەر هەر ڕوویان لەوقسە ڕاستەیە وەرگێراو بۆ یەکتاپەرستیی نەهاتن بەدەمتانەوە، بەڕاشکاوی پێیان بلْێن: دەسا ئێوە بەشایەت بن و بزانن کە بەڕاستیی ئێمە موسلْمان وملکەچی بڕیارەکانی خواین و، سووریشین لەسەر دینی خۆمان و، خواش تاكو تەنیایەو، ئیتر نە عوزەیر خوایەو، نەعیسایش.

**ئەهلی کیتاب لە بارەی دینی ئیبراهیمەوە قسە دەکەن:**

﴿٦٥ يا أهل الكتاب لم تحاجون في إبراهيم﴾ ئەی خاوەن نامەکان! ئێوە بۆچی لەبارەی ئیبراهیمەوە بەناهەق دەدوێن و، هەریەکەتان وا قسە دەکەن کە ئیبراهیم لەسەر دینی ئەوبێ؟! ﴿وما أنزلت التوراة والإنجيل إلا من بعده﴾ خۆ دەشزانن کە تەورات و ئینجیل زۆر لەپاش ئیبراهیمەوە نێردراون ﴿أفلا تعقلون﴾ دەسا بۆچی لەوقسانەی دەیانکەن تێنافکرێن ؟ خۆ ئیبراهیم بەر لەموساو عیسا بووە ﴿٦٦ ها أنتم هؤلاء حاججتم فيما لكم به علم﴾ وامان دانا کە ئێوە دەتوانن موجادەلە لەبابەت ئەوشتانەوە بکەن کە زانیاریتان دەربارەیان هەیە، واتە: لەبارەی دینی

خۆتانەوە هەتا ئەورۆژە موحەممەد ﷺ هات، ئەگەر شتێکیش بڵێن دەکرێ ئاگاتان لێی بێت ﴿فلم تحاجون فیما لیس لكم به علم﴾ ئەی بۆچی لەشتێکدا کێشە دەکەن کە هیچ زانست و زانیاریتان دەربارەی نییە؟" جارێ ئەڵێن ئیبراهیم لەسەر دینی جوولەکەیە، جارێکیش ئەڵێن لەسەر دینی گاورانە؟ ﴿والله یعلم وانتم لا تعلمون﴾ دیارە کە هەرخوا ئەوشتانە ئەزانێ، خۆی بەئاگایەو دەزانێ ڕاست وناڕاست چۆنە، بەڵام ئێوە هیچی لێ نازانن، کەوابوو زانیاریتان بەهەرشتێك نەبوو، لەخۆتانەوە قسەی لێ مەکەن، بەڵکو حەواڵەی زانیاریی خوای گەورەی بکەن، ئێوە کە لەپاش ئیبراهیمەوە هاتوون، چۆن خۆتان دەکەنە خاوەنی و دەڵێن: لەسەر دینی ئێمە بووە! ﴿[٦٧] ماكان إبراهیم یهودیا ولا نصرانیا﴾ دڵنیابن کە ئیبراهیم نە جوولەکەبوو، نەگاور ﴿ولكن كان حنیفا مسلما وما كان من المشركین﴾ بەڵکو خوا بە یەکزان و یەکتاپەرست و ملکەچ و ڕاساڵ و موسڵمانێك بوو، تەنها ساتێکیش لەهاوبەش پەیداکەران نەبوو، ئیتر بۆ دەڵێن: (كونوا هودا أو نصارا تهتدوا)؟! ﴿[٦٨] إن أولی الناس بإبراهیم للذین اتبعوه﴾ ئەوانەی کەلە هەمووکەسێ بەئیبراهیمەوە نزیکترن، ئەوانەن کە ئەوسا شوێنی ئەکەوتن ﴿وهذا النبی والذین آمنوا﴾ و ئەم پێغەمبەرەو ئەوانەشن کە باوەڕیان پێ هێناوە، نەك ئێوەی جولەکەو گاور، کەوابوو خۆشەویستی و پەیرەوی کردن بەسەر زارەکی نابێت ﴿والله ولی المؤمنین﴾ بێگومان خوا پارێزەرو یارو یاوەری گشت ئیماندارانە.

ڕێنماییەکانی ئایەتی (٦٤-٦٨):

١- هەرگیز ئادەمی لە ئەمن و ئاسایشدا ناژی، تا بنەمای یەکسانی: (..ألا نعبد إلا الله..)وە دەس نەگرێ.

٢- مێژوی ڕەواو ڕاست دەبێتە بەڵگەنامە، هەروەکو خوای گەورە سەرنجی جوولەکەو گاورەکانی ڕاکێشا بۆ پێشەڕەی خۆیان.

٣- موجادەلەو کێشەی بێ بەڵگەو زانست لەهیچ کەسێك وەرناگیردرێ.

٤- یەهودییەت ونەسرانییەت، هەردوو بیدعەو داهێنراون ، وە بەهیچ کلۆجێ دین نیین.

٥- موسڵمانان ئەگەرچی زمان و خاك و وڵاتیان جیاوازو لەیەك دووربێ، بەڵام لەبنەرەتدا هەموو یەکن و پشتیوانیان خوایە، بۆیە فەرموی: (والله ولی المؤمنین).

**خاوەن نامەکان دەیانەوێ ئێوە لەدین کلابن:**

﴿[٦٩] ودت طائفة من أهل الكتاب لو یضلونكم﴾ دەستەیەك لەخاوەن نامەکان حەزیان دەکرد، ئێوەی (موسڵمان) گومڕا بکەن ﴿وما یضلون إلا انفسهم﴾ کەچی مەگەر هەرخۆیان سەرلێشێواوو گومڕا بکەن ﴿وما یشعرون﴾ و بەم ڕاستیەش هەست ناکەن ﴿[٧٠] یا أهل الكتاب لم تكفرون بآیات الله﴾ ئەی خاوەن نامەکان! بۆچی بڕواتان بەئایەت و نیشانەکانی خوا بێ باوەڕدەبن ؟خۆ هەموو بەڵگەن بۆڕاستی پێغەمبەر ﴿وانتم تشهدون﴾ بۆخۆشتان شایەتن وئەزانن کەئەوئایەتانە ڕاست و دروستن. ﴿[٧١] یاأهل الكتاب لم تلبسون الحق بالباطل وتكتمون الحق﴾ ئەی خاوەن نامەکان! بۆچی بەرگی باتڵ و ناهەق ئەکەنە بەرهەق و ڕاستیەکانی پێدەشارنەوەو خەڵکی چەواشە دەکەن؟ ﴿وانتم تعلمون﴾ لەکاتێکدا خۆیشتان چاك ئەزانن کەکامە هەقەو، کامەش ناهەق ﴿[٧٢] وقالت طائفة من أهل الكتاب آمنوا بالذی أنزل علی الذین آمنوا وجه النهار﴾ دەستەیەك لەخاوەن نامەکان بەهەندێکیانیان گوت: ئێوە وەرن لەتاقی بەیانیدا باوەڕ بەو قورئانە بێنن بۆ ئیماندارەکان هاتووە ﴿واكفروا آخره لعلهم یرجعون﴾ لەکۆتایی ئاخرو ئۆخری ڕۆژدا، واتە: تاقی ئێواران پەشیمان ببنەوەو بەدرۆی بخەنەوە، بەڵکو موسڵمانەکانیش توشی دوودڵیی ببن و بگەڕێنەوەو واز لە موحەممەد ﷺ بێنن و بڵێن: جائەگەر ئیسلام ڕاست بووبا ئەوانەی ئەهلی کیتاب چۆن لێی

پەشیمان نەئەبوونەوە، لەکاتێکدا خوێندەوارن وکتێبیان بۆ هاتووە؟ ﴿٧٣ ولا تؤمنوا إلا لمن تبع دينكم﴾ جوولەکە لەناو یەکترا گوتیان: تەنها بەوکەسانە باوەر بکەن کە لەسەردینی خۆتانن و، رازو نیازی خۆیشتان تەنها لای خۆتان بدرکێنن و، متمانە بەکەسی تر مەکەن و، تەنیاوتەنیا دینی خۆتان بەراست بزانن ﴿قل إن الهدى هدى الله﴾ بلێ: بەراستیی هەر خوایە رێگەی راست نیشان دەدا، چونکە رێی راست هەر هی ئەوە ﴿ان يؤتى احد مثل ما اوتيتم او يحاجوكم عند ربكم﴾ چونکە ئەگەر رازو نیازی خۆتان لای ئەم وئەو بدرکێنن وا ئەوانیش فێری ئەو زانست و بەڵگانە دەبن پێتان دراون، ئەوسا بۆرتان دەدەن، وەیان لای پەروەردگارتان فێر دەبن بەو بەڵگانە چەلەحانێتان لەگەڵ بکەن، مەبەستیان ئەوەیە نیشانەکانی هاتنی پێغەمبەر کەلەکتێبی تەوراتدا هەن, لای موسڵمانەکان نەدرکێنرێن ﴿قل إن الفضل بيدالله يؤتيه من يشاء﴾ بلێ: بەراستیی رێزو فەزڵ و پەیامبەرێتی بەدەست ئێوە نییە، بەڵکو هەر بەدەستی خوایە کێ حەز لێبکا ئەو فەزڵەی دەداتێ ﴿والله واسع عليم﴾ وە خوا پەرەدارەو، فرە زانا ﴿٧٤ يختص برحمته من يشاء﴾ هەرکەسێك ئەو بیەوێ بەر رەحمەت و میهرەبانی خۆی دەخات و "پەیامبەریەتی ئەداتێ" ﴿والله ذوالفضل العظيم﴾ خوا خاوەنی چاکەو فەزڵ و بەهرەی زۆر گەورەیە.

**خاوەن نامەکان و هەڵگرتنی سپاردە:**

﴿٧٥ ومن اهل الكتاب من إن تأمنه بقنطار يؤده إليك﴾ هەر لەناوخاوەن نامەکاندا کەسی واهەیە ئەگەر ماڵ ودارایی یەکی زۆری لەلا دانێت، هەرکە داوای لێبکەیت بەدەسپاکی دەتداتەوە، دیارە کەمتر بەئاسانتر (عبداللەی کوری سەلام) هەزار ئۆقییە ئاڵتوونیان لەلا دانا، بەپاکی دایەوە خاوەنەکەی ﴿ومنهم من إن تأمنه بدينار لا يؤده إليك﴾ هی وایشیان هەیە تەنها دینارێکی لەلا دانێیت بە سپاردە ناتداتەوەو دەیخوات ﴿إلا مادمت عليه قائما﴾ مەگەر خۆت

الجزء الثالث — سورة آل عمران

يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تَلۡبِسُونَ ٱلۡحَقَّ بِٱلۡبَٰطِلِ وَتَكۡتُمُونَ ٱلۡحَقَّ
وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ٧١ وَقَالَت طَّآئِفَةٞ مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ ءَامِنُواْ
بِٱلَّذِيٓ أُنزِلَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَجۡهَ ٱلنَّهَارِ وَٱكۡفُرُوٓاْ ءَاخِرَهُۥ
لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ٧٢ وَلَا تُؤۡمِنُوٓاْ إِلَّا لِمَن تَبِعَ دِينَكُمۡ قُلۡ إِنَّ
ٱلۡهُدَىٰ هُدَى ٱللَّهِ أَن يُؤۡتَىٰٓ أَحَدٞ مِّثۡلَ مَآ أُوتِيتُمۡ أَوۡ يُحَآجُّوكُمۡ
عِندَ رَبِّكُمۡۗ قُلۡ إِنَّ ٱلۡفَضۡلَ بِيَدِ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ
عَلِيمٞ ٧٣ يَخۡتَصُّ بِرَحۡمَتِهِۦ مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ
ٱلۡعَظِيمِ ٧٤ ۞ وَمِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ مَنۡ إِن تَأۡمَنۡهُ بِقِنطَارٖ
يُؤَدِّهِۦٓ إِلَيۡكَ وَمِنۡهُم مَّنۡ إِن تَأۡمَنۡهُ بِدِينَارٖ لَّا يُؤَدِّهِۦٓ إِلَيۡكَ إِلَّا
مَا دُمۡتَ عَلَيۡهِ قَآئِمٗاۗ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَالُواْ لَيۡسَ عَلَيۡنَا فِي ٱلۡأُمِّيِّـۧنَ
سَبِيلٞ وَيَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ ٧٥
بَلَىٰۚ مَنۡ أَوۡفَىٰ بِعَهۡدِهِۦ وَٱتَّقَىٰ فَإِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُتَّقِينَ ٧٦ إِنَّ
ٱلَّذِينَ يَشۡتَرُونَ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ وَأَيۡمَٰنِهِمۡ ثَمَنٗا قَلِيلًا أُوْلَٰٓئِكَ لَا
خَلَٰقَ لَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ وَلَا يَنظُرُ إِلَيۡهِمۡ
يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمۡ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ٧٧

٥٩

لەسەری راوەستیت وداوای بکەیتەوەو، بەزۆر لێی وەربگریتەوە ﴿ذلك بأنهم قالوا ليس علينا فى الأميين سبيل﴾ بەهانەشیان ئەمەیە کە دەیانوت: خواردنی ماڵ وسامانی ئەو نەخوێندەوارانە (عەرەبە موسڵمانەکان) هیچ گوناح و تاوانێکیان نییە، چونکە ماڵی گشت کەسێکی غەیری خۆیان بەحەڵاڵ ئەزانن! ﴿ويقولون على الله الكذب وهم يعلمون﴾ درۆ بۆخوای گەورە هەڵدەبەستن (کەدەڵێن خوا ماڵی ئەم وئەوی بۆ حەڵاڵکردوین، بۆیەمە خۆشیان ئەزانن کە درۆدەکەن ﴿٧٦ بلى من اوفى بعهده واتقى فإن الله يحب المتقين﴾ دیارە هەرکەسێکیان پەیمانی خۆی جێبەجێ بکاو، پابەندبێت پێیەوەو لەسنوورەکانی خواش خۆبپارێزی، بەوە دەبێتە پارێزکار، بەراستیی خوایش پارێزکارانی خۆش ئەوێت.

**پەیمانشکێن لەو دنیا بێ بەشە:**

﴿٧٧ إن الذين يشترون بعهدالله وأيمانهم ثمنا قليلا﴾ بێگومان ئەوکەسانەی پەیمانی خۆیان لەگەڵ خواو، وە سوێندەکانیان بە بەهایەکی کەم ئەفرۆشن، پەیمانیاندا هەرکە پەیامبەر هات باوەر بێنن، سوێندیشیان خوارد کە هاوکاریی ویارمەتی بدەن، کەچی بەپارەوپولێکی بێ بەها ئەوهەقەیان شاردەوە! ﴿أولئك لا خلاق لهم في الآخرة ولا يكلمهم الله ولا ينظر إليهم يوم القيامة ولا يزكيهم﴾ ئەوانە لەدوارۆژدا هیچ بەشیان نییە، خواش لەرۆژی قیامەتدا، قسەی میهرەبانیان لەگەڵ ناکاو، بەچاوێکی دلۆڤانیشەوە تەماشایان ناکاو، گوناهیان پاك ناکاتەوە ﴿ولهم عذاب أليم﴾ وە سەرەڕای ئەوانەیش گشت سزایەکی ئێش پێگەیەنەریان بۆهەیە، چونکە سوێندو پەیمانەکەیان نەبردە سەرو، درۆیانکردو، بەتەماحی دنیا هەقەکەیان ونکرد.

الجزء الثالث — سورة آل عمران

وَإِنَّ مِنْهُمْ لَفَرِيقًا يَلْوُونَ أَلْسِنَتَهُم بِالْكِتَٰبِ لِتَحْسَبُوهُ مِنَ الْكِتَٰبِ وَمَا هُوَ مِنَ الْكِتَٰبِ وَيَقُولُونَ هُوَ مِنْ عِندِ اللَّهِ وَمَا هُوَ مِنْ عِندِ اللَّهِ وَيَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٧٨﴾ مَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُؤْتِيَهُ اللَّهُ الْكِتَٰبَ وَالْحُكْمَ وَالنُّبُوَّةَ ثُمَّ يَقُولَ لِلنَّاسِ كُونُوا عِبَادًا لِّي مِن دُونِ اللَّهِ وَلَٰكِن كُونُوا رَبَّٰنِيِّـۧنَ بِمَا كُنتُمْ تُعَلِّمُونَ الْكِتَٰبَ وَبِمَا كُنتُمْ تَدْرُسُونَ ﴿٧٩﴾ وَلَا يَأْمُرَكُمْ أَن تَتَّخِذُوا الْمَلَٰٓئِكَةَ وَالنَّبِيِّـۧنَ أَرْبَابًا أَيَأْمُرُكُم بِالْكُفْرِ بَعْدَ إِذْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿٨٠﴾ وَإِذْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَٰقَ النَّبِيِّـۧنَ لَمَآ ءَاتَيْتُكُم مِّن كِتَٰبٍ وَحِكْمَةٍ ثُمَّ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مُّصَدِّقٌ لِّمَا مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِۦ وَلَتَنصُرُنَّهُۥ قَالَ ءَأَقْرَرْتُمْ وَأَخَذْتُمْ عَلَىٰ ذَٰلِكُمْ إِصْرِى قَالُوٓا أَقْرَرْنَا قَالَ فَاشْهَدُوا وَأَنَا مَعَكُم مِّنَ الشَّٰهِدِينَ ﴿٨١﴾ فَمَن تَوَلَّىٰ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُولَٰٓئِكَ هُمُ الْفَٰسِقُونَ ﴿٨٢﴾ أَفَغَيْرَ دِينِ اللَّهِ يَبْغُونَ وَلَهُۥٓ أَسْلَمَ مَن فِى السَّمَٰوَٰتِ وَالْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ ﴿٨٣﴾

قل ءامنا — ٦٠

**ڕێنماییەکانی ئایەتی (٧٥-٧٧):**

١- جوولەکە متمانەی پێ ناکرێ و عەهدو پەیمان ناباتە سەرو، هەمیشە گزی و خەیانەت پیشەیانە.

٢- هەرکەرسێ درۆ بکا لەگەڵ خوادا , بێ شك لەگەڵ ئەم وئەودا, دەتوانێ پتر درۆ بکا.

٣- جوولەکە پێیان وایە گەلانی تر پیس و ناپاکن و، ماڵ و منداڵیشیان حەڵاڵە بۆیان.

٤- خەیانەتی پەیمان شکاندن لەبەر خاتری ماڵ و سامان لە هەمووشتێ گەورەترو سامناکترە.

**خاوەن نامەکان کتێبی خوا دەگۆڕن:**

﴿٧٨ وإن منهم لفريقا يلوون ألسنتهم بالكتاب﴾ بەراستیی هەر لەخاوەن نامەکاندا هەیە" وەك (کەعبی کوڕی ئەشرەف) لەکاتی خوێندنەوەی تەوراتدا جۆرێك زمانیان بەیەکدا دەدەن بەمەبەستی ونکردن و شاردنەوەی سیفەتەکانی پەیامبەر ﷺ ﴿لتحسبوه من الكتاب وماهو من الكتاب﴾ بۆئەوەی ئێوە وابزانن گوایا ئەوەی ئەوان دەیخوێنن تەوراتە، کەچی لەتەوراتیشدا نییە بەڵکو تەنها پێچراوەو دروستکراوێکی خۆیانە ﴿ويقولون هو من عندالله﴾ دەشڵێن: ئەوە کە دەیخوێنن خوا گووتویەتی وناردوویەتی ﴿وما هو من عندالله﴾ دڵنیاش بن لەلایەن خواوە نییە ﴿ويقولون على الله الكذب﴾ بەڵکو درۆ بەدەم خوا ئەکەن ﴿وهم يعلمون﴾ خۆیشیان ئەزانن کە درۆئەکەن. دۆڕانی چینی خوێندەوارو زانا، بەپارەو پوول وکورسیی و، هەر تەماحێکی تر، خەسارەت و کەسەرێکی زۆر گەورەیە، چونکە شێواندنی جوگرافیا ومێژووی رابووردوو، ون دەبێ و، ڕاستییەکانیش چەواشە دەکرێن.

**هیچ پێغەمبەرێ بەکەس ناڵێ بمپەرستن:**

گاورەکان دەیانگووت: عیسا فەرمانیداوە کەدەبێ ئەو بپەرستین! ئینجا خوا لەوەڵامیانا فەرمووێ: ﴿٧٩ ماكان لبشر أن يؤتيه الله الكتاب والحكم والنبوة﴾ بۆ هیچ مرۆڤێك ڕەوانییە کەخوا کتێب و نامەی دابێتێ و فێری

وەردەکاریی و لەکارزانی کردبێ و پلەی پەیامبەرێتی پێ دابێت (وەکو عیسا) ﴿ثم یقول للناس کونوا عبادا لی من دون الله﴾ پاشان بەخەڵکی بڵێت: وەرن لەباتی خوا ببنە بەندەی من و، من بپەرستن ، هەرگیز ئەوە رووی نەداوەو نابێ ﴿ولکن کونوا ربانیین﴾ بەڵکو بەخەڵکیان هەرئەمە گوتووە: وەرن ببنە زاناو، ملکەچی تەواوی فەرمانەکانی خوابن و، خوو سیفەتی خوایی بگرن ﴿بما کنتم تعلمون الکتاب وبما کنتم تدرسون﴾ چونکە ئێوە مەردم فێری نامەکەی خوا ئەکەن و، دەرسی خواناسی ئەخوێنن، پەیامبەری خوایش عیسا لەمە بەولاوە هیچ شتێ ناڵێت دەئیتر ئێوە ئەو درۆ شاخدارەیە بۆئەکەن؟! ﴿٨٠ ولا یأمرکم أن تتخذوا الملائکة والنبیین أربابا﴾ فەرمان بە هیچ کامیشتان نادەن بچن فریشتەو پێغەمبەران بکەنە خواو بیانپەرستن، خوا چۆن کەسێ دەکاتە پەیامبەر لەملاولەولاوە بڵێت لەگەڵ خوادا منیش، وەیان فلانیش بپەرستن ﴿أیأمرکم بالکفر بعد إذ أنتم مسلمون﴾ ئاخۆ ئەرمانتان پێدەکا بەکوفرو لەدین وەرگەڕان، پاش ئەوەی ئێوە موسڵمان بوون و یەکلابوونەوە بۆخوا؟ زۆرێك هەن بەر ئەوهەرەشەیە دەکەون و، مەردم دەکەنە کۆیلەی خۆیان و، بەهرەی دنیایان لێوەردەگرن و، خۆیشیان لێ کەرکردووە زانست و زانیارییەکەیان بەرەو خوا نەیبردوون بۆیە پەیامبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((نعوذ بالله من علم لا ینفع، وقلب لا یخشع..))، واتە: پەنا بەرخوا دەبەم لەزانستێك قازانجی نەبێت، لەدڵێکیش لەخوا شەرم نەکاو نەترسێ ﴿٨١ وإذ أخذ الله میثاق النبیین﴾ ئەوکاتەیان وەبیر بێنەوە کەخوا پەیمانی بتەوو بەهێزی لە یەکەیەکەی پەیامبەران وەرگرت ﴿لما آتیتکم من کتاب وحکمة﴾ کە هەرچەندە کتێب و نامەی زانستی و حیکمەتم پێدابن ﴿ثم جاءکم رسول مصدق لما معکم﴾ وەپاشان پەیامبەرێك هاتە ناوتان و ئەوەی ئێوەیشی بەراست زانی. خوا "هەرئەوکاتە" پەیمانی لێوەرگرتن کە: ﴿لتؤمنن به ولتنصرنه﴾ ئەبێ باوەڕی پێ بێنن و، هاوکاریی ویارمەتیشی بدەن. ئیبنی عەبباس ئەڵێت: خوا هەر پەیامبەرێکی ناردبێت پەیمانی لێوەرگرتووە کە "سەرەرای خۆیشی" دەبێ هۆزو گەلەکەشی ئاگادار بکات ، کە باوەر بەوپەیامبەرە بێنن، مەبەست ئەوەیە کە موساو عیساش (علیهما السلام) هەر ئەوڕۆژە بەگەلەکەیان راگەیاندووە کەهەرکات موحەممەد ﷺ هات، باوەری پێ بێنن ﴿قال أقررتم وأخذتم علی ذلکم إصري﴾ جا خوا بەپەیامبەرەکانی وت: ئایا ددانتان بەوەدا ناو پەیمانەکەی منتان وەرگرت؟ ﴿قالوا أقررنا﴾ وتیان: بەڵێ پەیمانمان داو، هەروا دەکەین ﴿قال فاشهدوا﴾ ئەوسا خوا فەرمووی: دەسا ئێوە لەناوخۆتانا بۆئەم بەڵێنە بەشایەت بن ﴿وأنا معکم من الشاهدین﴾ وا منیش لە گەڵتانم وشایەتم لەسەر ئەو پەیمانە.

**پێغەمبەران بەڵێنیان داکە: باوەڕ بە موحەممەد بێنن:**

﴿٨٢ فمن تولی بعد ذلك فأولئك هم الفاسقون﴾ ئینجا هەرکەسێك لەمە بەدواوە لەو پەیمانە پاشگەز بێتەوەو رووی لێوەربگێڕێ، "فاسق" و لەسنوور دەرچووە، کەوابوو ململانێ و خۆکلاکردنی فەلەو جوولەکەکان لەباوەرهێنان بەموحەممەد وبەرنامەکەی؛ راکردنە لەراستییەکان وخۆدەربازکردنە لێیان و یاخی بوونیشە لەپێغەمبەرەکانیان.

**بەدەر لە ئیسلام هیچ دینێ قبووڵ نیە:**

﴿٨٣ أفغیر دین الله یبغون﴾ ئاخۆ دینێکیان دەوێ، غەیرەز دینی خوا (خاوەننامەکان)؟ ئایین و بەرنامەکەی خوا دەبوێرن ﴿وله أسلم من في السموات والأرض طوعا وکرها﴾ کە هەرچی لەئاسمانەکان و زەویدایە بیانەوێ و، نەیانەوێ موسڵمان و ملکەچی فەرمانی ئەون و، هیچ کەسێك ناتوانێ لەژێر دەسەڵاتی خوا، خۆی لابدات ﴿وإلیه یرجعون﴾ و هەموانیش تەنها هەر بۆلای ئەو دەگەڕێنرێنەوە، سەرئەنجامیش هەموو تۆڵەو پاداشتی خۆیان

وەرئەگرن، هەرکەسێك بەدەر لەدینی ئیسلام، تێکۆشی بۆهەر بەرنامەیەکی ترو، لەپێناویا خەبات بکات، کارێکی
درێوی کردووەو، لای خوایش زۆر بێزراوو قێزەونە. ﴿٨٤ قل آمنا بالله وما انزل علينا﴾ بڵێ: خۆم و گەلەکەم
باوەڕمان هێناوە بەوقورئانە ﴿وما انزل على إبراهيم وإسماعيل وإسحاق ويعقوب والأسباط﴾ بەو پەڕاوانەش کەبۆ
ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و نەوەکانی ئەو (یوسف وبراکانی یوسف) هاتبوو، دەستەیەك لە
زانایان دەڵێن: مەبەست بە (ئەسباط) نەتەوەو گەلی (بەنی ئیسرائیل)ە، نەك نەوەکانی یەعقووب کەهەندێ ڕەفتاریان
لێوەشایەوە لەگەڵ پلەی پەیامبەرایەتییدا نەدەگونجا. ئەمە راوبۆچوونی ئیمامی (بوخاریی) و(ئیبن کەسیر). ﴿وما
أوتی موسی وعیسی﴾ باوەڕیشمان بەو تەورات وئینجیلە کە بۆمووسا و عیسا هاتووە ﴿والنبیون من ربهم﴾ وە
بەگشت پەیامبەرانی دی وەکو(داودو سولەیمان وئەیوب)
هەیە ﴿لا نفرق بين احد منهم﴾ لەبەرامبەر هیچ
کەسێکیشیاندا جیاوازییمان نییە وبڕوامان بەهەموویان
هەیە، چونکە ئێمە وەك گاورو جوولەکە ناکەین ﴿ونحن له
مسلمون﴾ تەنهاو تەنها ملکەچ وگوێرایەڵی ئەوین،
سەرپێچی لەهیچ بڕیارێکی ناکەین ﴿ومن يبتغ غير الإسلام
دينا فلن يقبل منه﴾ هەرکەسێ بێجگە لەبەرنامەو شەریعەتی
ئیسلام هەردینێك بۆخۆی هەڵبژێرێ و بیکا بەبەرنامەی
خۆی هەرگیز لێیوەرناگیردرێ ﴿وهو في الآخرة من
الخاسرين﴾ و لەدوارۆژیشدا لەریزی زیانمەنداندە.

**خوا نەناس لەگیانەڵادا نە تەوبەی قبووڵە، نەپارتەقای:**

﴿٨٦ كيف يهدي الله قوما كفروا بعد إيمانهم وشهدوا أن
الرسول حق وجاءهم البينات﴾ جا خوا چۆن رێنمایی گەلێك
ئەکات دوای ئەوەی باوەڕیان هێناو شایەدییاندا کە ئەم
پەیامبەرە راستەو چەندین نیشانەو موعجیزەیان بۆ هاتبوو،
کەچی سەر لەنوێ بێ باوەڕ بوونەوە؟ (ئیبن عەباس) -خوا
لێی رازی بێ- ئەڵێ: پیاوێك لەیارمەتیدەرانی (مەدینە)
ئیمان و بڕوای هێنا، پاشان وەرگەڕایەوەو پەیوەندی کردەوە بەهاوبەش دانەرەکانەوە، دوایی ناردی بۆلای
خزمەکانی خۆی کە: بنێرنە لای پەیامبەر ﷺ بەڵکو عافوی بکاو تەوبەی لێوەربگرێ؟ ئەوسا ئەم ئایەتی: (کیف
یهدی الله قوما کفروا بعد إیمانهم) هەتا (إن الله غفور رحیم) هات. (الحدیث رجاله رجال الصحیح). ﴿والله لا یهدی
القوم الظالمین﴾ دیارە ئەوجۆرە گەلانە ستەمکارن، هەرگیزیش خوای گەورە گەلی ستەمکار رێنمایی ناکات ﴿٨٧
أولئك جزاؤهم أن عليهم لعنة الله والملائكة والناس اجمعين﴾ سزای ئەمانە هەرنەفرینی خوایەو نەفرینی فریشتەیە
ونەفرینی تەواوی خەڵکی ئەم دنیایە ﴿٨٨ خالدين فيها﴾ و بە هەتاهەتاییش لەو نەفرینەدا ئەمێننەوە ﴿لا يخفف
عنهم العذاب ولا هم ينظرون﴾ سزایشیان قەت لەسەر سووك ناکرێ و، مۆڵەتی هێنانەوەی بڕوبیانووشیان پێنادرێ
﴿٨٩ إلاالذين تابوا الله من بعد ذلك واصلحوا﴾ مەگەر ئەوانەیان دوای ئەوکارە پەشیمان بووبنەوەو تەوبە بکەن ﴿فإن

الجزء الثالث — سورة آل عمران

قُلْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا وَمَآ أُنزِلَ عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطِ وَمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمْ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُۥ مُسْلِمُونَ ﴿٨٤﴾ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي ٱلْءَاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٨٥﴾ كَيْفَ يَهْدِي ٱللَّهُ قَوْمًا كَفَرُوا۟ بَعْدَ إِيمَٰنِهِمْ وَشَهِدُوٓا۟ أَنَّ ٱلرَّسُولَ حَقٌّ وَجَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِي ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٦﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ جَزَآؤُهُمْ أَنَّ عَلَيْهِمْ لَعْنَةَ ٱللَّهِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿٨٧﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا لَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ ٱلْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ ﴿٨٨﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٨٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بَعْدَ إِيمَٰنِهِمْ ثُمَّ ٱزْدَادُوا۟ كُفْرًا لَّن تُقْبَلَ تَوْبَتُهُمْ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلضَّآلُّونَ ﴿٩٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ كُفَّارٌ فَلَن يُقْبَلَ مِنْ أَحَدِهِم مِّلْءُ ٱلْأَرْضِ ذَهَبًا وَلَوِ ٱفْتَدَىٰ بِهِۦٓ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٩١﴾

٦١

﴿الله غفور رحیم﴾ چونکە بەراستیی خوا بەرامبەر بەوانە زۆر لێبوردەیە، زۆریش دلۆڤان و میهرەبانە، ﴿٩٠ إن الذین کفروا بعد إیمانهم ثم ازدادوا کفرا﴾ ئەوکەسانە کە دوای باوەڕهێنان کافر بوونەوە، هەروا مانەوە لە بێ باوەڕییدا هەتا مردن، مەبەست جوولەکەکانە، دوای باوەڕهێنانیان بە موسا، پشتیان لەعیسا هەڵکرد، کاتێ موحەممەدیش هات ﷺ ڕوویان لەویش وەرگێڕا ﴿لن تقبل توبتهم﴾ هەتا ئاوابن هەرگیز تەوبەیان لێوەرناگیرێ ﴿واولئك هم الضالون﴾ بێگومان ئەوانە چونەتە ناو دەستەی گومڕاو سەرلێشێواوەکانەوەو بۆخۆیان سەرلێشێواون ﴿٩١ إن الذین کفروا وماتوا وهم کفار﴾ بێگومان ئەوانەی کە بێ باوەڕبوون و هەر بەبێ باوەڕیش مردوون ﴿فلن یقبل من احدهم ملء الارض ذهبا ولو افتدی به﴾ بێگومان هەریەکەیان ئەگەر پڕی ئەم زەوییە زێڕیش بۆ کەفارەتی گوناحی خۆی بدا، هەرگیز لێی وەرناگیردرێ ﴿اولئك لهم عذاب الیم﴾ ئەوانە سزای ئێش پێگەیەنەریان بۆدەبێ ﴿وما لهم من ناصرین﴾ و هیچ یارمەتیدەرێکیش بەهانایانەوە نایە ﴿٩٢ لن تنالوا البر حتی تنفقوا مما تحبون﴾ هەرگیز ناگەنە هیچ پلەیەکی خێرو چاکە- تا لەوشتەی خۆتان خۆشتان دەوێ نەبەخشن لەرێی خوا ﴿وما تنفقوا من شئ فإن الله به علیم﴾ بیشزانن هەر شتێك ببەخشن لەرێی خوا، خوا پێی زاناو ئاگایەو هەربۆتان ئەهێڵێتەوەو، پاداشتانی ئەداتەوە.

ئیمامی (بوخاریی) و(موسلیم) ئەڵێن: پاش هاتنی ئەم ئایەتە، پێشەوا (عومەر) -خوا لێی رازی بێت- ویستی بەشەکەی (خەیبەر)یی کە لە هەمووشتێ لای خۆشەویستر بوو بدا لەرێی خوا، پەیامبەریش ﷺ فەرمووی: وامەکە، بەڵکو باخەکە بهێڵەوە بۆخۆتو، بەرەکەی ببەخشە.

## رێنمایی ئایەتی (٩٢):

١) هەموو راستیی و چاکەیەك مرۆ رێنوێنی دەکا بۆ بەهەشت ئەم فەرموودەی: ((علیکم بالصدق فإن الصدق یهدي الی البر، وإن البر یهدي الی الجنة، ولا یزال الرجل یصدق و یتحري الصدق حتی یکتب عند الله صدیقا..)) هەر ئەو هەقیقەتە دەسەلمێنێ.

٢) کاتێکیش ئەم ئایەتەی (لن تنالوا البر..) هات هاوەڵان چەسپانیان کرد بۆ بەخشینی ماڵ، عومەر کەنیزێکی هەبوو زۆریش خۆشی ئەویست، لە ڕێی خوادا ئازادی کرد، (زەیدی کوڕی حاریسە)ش باشترین ئەسپی سواری هەبوو، هەرلە رێگای خوادا کردییە سەدەقە، (ئەبو تەلحە)ش باخەکەی (بەیرەحا)ی بەخشی، بێ لەمانەش (خوا لەگشتیان رازی بێ). دەستیان هەرلە خێردا بووە.

الجزء الرابع | سورة آل عمران

لَن تَنَالُوا۟ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا۟ مِمَّا تُحِبُّونَ ۚ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِن شَىْءٍ
فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ ﴿٩٢﴾ ۞ كُلُّ ٱلطَّعَامِ كَانَ حِلًّا لِّبَنِىٓ
إِسْرَٰٓءِيلَ إِلَّا مَا حَرَّمَ إِسْرَٰٓءِيلُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ مِن قَبْلِ أَن تُنَزَّلَ
ٱلتَّوْرَىٰةُ ۗ قُلْ فَأْتُوا۟ بِٱلتَّوْرَىٰةِ فَٱتْلُوهَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ
﴿٩٣﴾ فَمَنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ
هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٩٤﴾ قُلْ صَدَقَ ٱللَّهُ ۗ فَٱتَّبِعُوا۟ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا
وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٩٥﴾ إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِى
بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٦﴾ فِيهِ ءَايَٰتٌۢ بَيِّنَٰتٌ مَّقَامُ
إِبْرَٰهِيمَ ۖ وَمَن دَخَلَهُۥ كَانَ ءَامِنًا ۗ وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ
مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا ۚ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ عَنِ ٱلْعَٰلَمِينَ
﴿٩٧﴾ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لِمَ تَكْفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ شَهِيدٌ
عَلَىٰ مَا تَعْمَلُونَ ﴿٩٨﴾ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لِمَ تَصُدُّونَ عَن
سَبِيلِ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ تَبْغُونَهَا عِوَجًا وَأَنتُمْ شُهَدَآءُ ۗ وَمَا ٱللَّهُ
بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٩٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِن تُطِيعُوا۟
فَرِيقًا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ يَرُدُّوكُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ كَٰفِرِينَ ﴿١٠٠﴾

٦٢ | وكيف تكفرون

کۆتایی جزمی سێیەم
ولله الحمد والمنة
*** *** ***

**هیچ خواردنێك لە بەنی ئیسرائیل حەرام نەبوو:**

﴿⁹³ كل الطعام كان حلا لبنى إسرائيل﴾ هەموو خۆراك و خواردەمەنییەكی پاكو حەلاڵ, بۆنەوەكانی (یەعقووب) حەلاڵ و رەوابوو.. واتە: جۆرە شتێكی وایان لێ یاساغ نەبوو ﴿إلا ماحرم إسرائیل على نفسه من قبل أن تنزل التوراة﴾ ئەوە نەبێت كەیەعقووب پێش هاتنی تەورات, بۆخۆی پارێزی لێكردوو, بۆخۆی قەدەغەی كرد. پێشەوا (ئەحمەد) لەوبارەیەوە فەرموودەیەكی درێژ ریوایەت دەكا, لەبەشێ لەو فەرموودەدا هاتووەو دەڵێت: یەعقووب نەخۆشییەكی سەختی گرت، پاشان نەزری كرد كە: ئەگەر خوا شفای بدات, جارێكی تر گۆشت وشیری وشتر نەخواو پارێزی لێبكا، ئەگەرچی حەزیشی لێبكا، ئینجا خوا نەزرەكەی لێوەرگرت و، شفای نەخۆشییەكەی دا، ئیتر لەمەوە جوولەكەكانیش, چاویان لەوكردو گۆشت وشیری وشتریان لەخۆیان یاساغكرد! واتە: حەق نەبوو ئەوان ئەو گۆشتە لەخۆیان یاساغ بكەن، چونكە ئەوتەنها بۆخۆی پارێزی لێكردو، هەر لەخۆی حەرامیكرد، جابۆ پتر زانیاری لێی, تەماشای تەفسیری (ئیبن كەسیر) بكە ﴿قل فأتوا بالتوراة فاتلوها إن كنتم صادقین﴾ ئەی پێغەمبەرﷺ بەجوولەكە بڵێ: ئەگەر ئێوە راست ئەكەن ئەڵێن هیچ شتێك بەبۆنەی ستەمی ئێمەوە یاساغ نەكراوە، بەڵكو خوا بەمەیلی خۆی حەرامیكردووە، دەسا تەورات بێنن و بیخوێننەوەو بزانن وایە ؟ ﴿⁹⁴ فمن افترى على الله الكذب من بعد ذلك﴾ جا دوای ئەوە روون بوویەوە كە: هیچ خواردەمەنییەك لەپێشدا قەدەغە نەبووە، ئیتر هەركەسێك لەسەر خوا درۆ هەڵبەسێ ﴿فأولئك هم الظالمون﴾ ئەوانەن ستەمكار ﴿⁹⁵ قل صدق الله﴾ بڵێ: هەرچی خوا گوتوویەتی، راستیی فەرمووەو ئەوكارەی ئێوە لەئایینی بابی (ئیبراهیم) دا نەبووە، بەڵكو خۆتان دروستتان كردووە ﴿فاتبعوا ملة إبراهیم﴾ دەسا ئێوەش هەر لەئایینی ئیبراهیم پەیڕەویی بكەن، نەك لەئایینێك جوولەكەو گاور بۆخۆیان دایانهێناوە ﴿حنیفا﴾ كە ئیبراهیم هەرخوا پەرستو هۆگری هەق بوو، لەهەموو ئایینێكی پووچەڵ و ناڕەوا لای دابوو و تەنها بۆخوا ملكەچ بوو ﴿وماكان من المشركین﴾ وە لە موشریكان و هاوبەشدانەران نەبوو.

رێنمایی ئایەتەكانی(٩٣-٩٥): لەشەریعەتەكانی تریشدا (نەسخ) هەربووە، وەكو ئەوەكە خوا هەندێ خواردەمەنی لەسەر جوولەكە، بەهۆی سەرپێچی خۆیانەوە حەرامكرد، پاش ئەوە كەبۆیان حەلاڵ بوو، درۆو دەلەسەی جوولەكە كە دەڵێت بابی ئیبراهیم (یەعقووب) بوو, گۆشت و شیری وشتری حەرامكرد.

**یەكەمین ماڵ بۆ خوا پەرستیی دروستكرا (كابە) بوو:**

﴿⁹⁶ إن أول بیت وضع للناس للذى ببكة﴾ بەراستیی یەكەمین (ماڵ) بۆ مەردم سازكرا لەرووی زەوییدا ، تا لەخواپەرستییدا رووی تێبكەن، ئەوماڵەیە لەمەككەدایە, واتە: كابەی پیرۆز ﴿مباركا وهدى للعالمین﴾ جێگایەكی زۆر پیرۆزو پڕ لەخێروو سەرچاوەی ژیانە، نیشانگەی خواناسینە بۆهەموو خەڵكی جیهان، ئیمامی (موسلیم) لە (ئەبازەڕی غەففاری)یەوە ئەڵێ: لەپێغەمبەرم ﷺ پرسی: یەكەمین مزگەوت لەزەوییدا چ مزگەوتێك بوو؟ ئەویش فەرمووی: ((المسجدُ الحرام، قلت ثم أیّ ؟ قال: المسجدُ الأقصى، قلتُ: كم بینهما؟ قال: أربعون عاماً، ثم جُعلَت الأرضُ لك مسجداً، فحیثما أدرَكَتْكَ الصلاةُ فَصَلّ)) واتە: یەكەمین مزگەوت، مزگەوتی (حەرام) بوو، وتم ئەی پاش ئەو؟ فەرمووی: مزگەوتی (ئەقسا)ی (بیت المقدس) وتم: ماوەی دروستكردنی نێوانیان چەندساڵ بوو؟ فەرمووی: چل ساڵ، جا بۆدوایی فەرمووی: رووی زەوی گشت بۆ تۆ كراوەتە مزگەوت، ئەوسا لەهەر جێگایەكدا بوویت و كاتی نوێژ هات، لەوێ نوێژەكەت بكە.

**ئاسەواری ئیبراهیم و حەجی ماڵی خوا:**

﴿[٩٧] **فیه آیات بینات مقام إبراهیم**﴾ چەند بەڵگەی روون وئاشکرای تێدایە واتە: لەکەعبەدا، یەکێکیان مەقامو ئاسەواری جێ پێیەکانی ئیبراهیمە، ئەوکاتە کابەیان دیوار ئەکردو ئەوەستا، دەسا ئاخۆ جێگایەکی پیرۆزی وا شایستەی ئەوە نییە، بکرێ بە نوێژگاو تەنیا خوای تێدا بپەرسترێ ؟! ﴿**ومن دخله كان آمنا**﴾ وە هەرکەسیشی تێچووبێ وپەنای پێبردبێ ، ئەمین و بێ ترسبووە لە زیان ودەستدرێژی کردنە سەر. (ئیبن عەبباس) دەڵێت: ئەگەر بکوژی بابیشم لەوێدا ببینم ، لەبەر رێزو حورمەتی کابە، دەستی بۆ نابەم ﴿**ولله على الناس حج البيت من استطاع إليه سبيلا**﴾ خوا حەجی کەعبەی بڕیارداوە لەسەر مەردم، لەسەر ئەوەی توانای رێگای هەبێ ﴿**ومن كفر فإن الله غني عن العالمين**﴾ و هەرکەسێکیش باوەڕی بەوحەجە نەبێ، ئەوە باچاك بزانێ کەکافرو بێ باوەڕە، بەراستیی خوایش لەتەواوی خەڵکانی جیهان، نەك تەنها هەر لەوان، بێ نیازە!.

**لەرێنماییەکانی ئایەتی (٩٧):**

١- بەحەج و تەوافی ماڵی خوا بەرەکەت دەس ئەکەوێ.

٢- ئەوکەسەی بتوانێ حەج بکاو، ئەوسا بێ هۆیەکی شەرعیی پشتگوێی بخاو نەیکا، کافر ئەبێ.

٣- لەماوەی تەمەندا یەکجار حەج فەرزە، چونکە فەرموودەی: ((لا، ولو قلتُ نَعَمْ لَوَجَبَتْ)) لەوەڵامی پرسیارێکدا، باشترین بەڵگەیە بۆئەوە.

٤- بێ نیازیی خوا لەتەواوی بوونەوەر، لەگەڵ جێگای تریشدا هاتووە، بۆنموونە: سوورەتی ئیبراهیم/٨: (وقال موسى إن تكفروا أنتم ومن فى الأرض جميعا فإن الله لغنى حميد) وە لەسوورەتی (زومەر/٧)دا: (إن تكفروا فإن الله غنى عنكم ولا يرضى لعباده الكفر) وە لەسوورەتی (تەغابون/٦)دا ئەفەرموێ: (فكفروا وتولوا واستغنى الله والله غنى حميد) وە لەسوورەتی (یوونس/ ٦٨)دا ئەفەرموێ: (قالوا اتخذالله ولدا سبحانه هو الغنى..) وە لەسوورەتی (فاتیر/١٥)دا ئەفەرموێ: (يا أيها الناس أنتم الفقراء إلى الله والله هو الغنى الحميد).

**خاوەن نامەکان لە دینی خوا لایاندا:**

﴿[٩٨] **قل ياأهل الكتاب لم تكفرون بآيات الله**﴾ ئەی پێغەمبەر! ﷺ بەخاوەن نامەکان بڵێ: بۆچی ئێوە بەئایەتەکانی خوا -کە بەڵگەی راستیی پەیامبەرن- کافرو بێ باوەڕن؟ ﴿**والله شهيد على ما تعملون**﴾ و خوا لەسەر هەموو کاروکردەوەیەکتان شایەدو ئاگادارە، ناترسن لەخوایەکی ئاوا قارتان لێبگرێ؟ ﴿[٩٩] **قل ياأهل الكتاب لم تصدون عن سبيل الله من آمن**﴾ ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ: بۆچی ئێوەی خاوەن نامە، رێی خوا لەباوەڕدارەکان دەگرن و، ناهێڵن بکەونە شوێنی رێگاکەی و، ریبازەکەی دادەخەن لێیان ﴿**تبغونها عوجا**﴾ ئەتانەوێ بەلاروخێچی نیشانی خەڵکی بدەن و، ئەو موسڵمانانەشی لێ پەشیمان بکەنەوە باوەڕیان پێهێناوە، بۆیە ئەتانەوێ هەردەم سیفەتەکانی پەیامبەر ﷺ کە لەتەوراتدا هەن، بگۆڕن و راست و ناڕاست ئاوێتە بکەن ﴿**وانتم شهداء**﴾ و بۆخۆشتان چاك ئەزانن و شایەتن کەهەر ئەورێگایە موحەممەدی ﷺ لەسەرە، راست و دروستەو، سەرجەم‌بەرنامەو رێچکەکانی تر گشت باتڵ وناهەقن. (سەدیی) دەڵێت: ئەگەر لێیان پرسیبان: ئایا ناووسیفەتی موحەممەد ﷺ لەتەوراتدا هەیە؟ ئەیانوت: نەخێر، شتی وانییە !بۆئەوە مەردم لەودینە تازەیە بتەکێننەوە. ﴿**وما الله بغافل عما تعملون**﴾ دڵنیاشبن هەرگیز خوا غافڵ و بێ ئاگا نییە لەوکارە چەوتانە ئێوە ئەنجامیان دەدەن، بۆیە هەر جۆرێ ململانێ دەکەن، ئاوا خوا تۆڵەتان دەدا.

## نابێ موسڵمان بە قسەی ئەهلی کتێب بکا:

(شەمماسی کوڕی قەیس)ی یەهودیی، هەرکە موسڵمانەکانی (ئەوس)و (خەزرەج)ـی دیت، زۆر بەخۆشی پێکەوە دەژین، خەریك بوو دڵی پڕ لەڕقی بتەقێ، بۆیە بەمەبەستی تێکدانی نێوانیان, جوولەکەیەکی ناردەلایان و رووداوە کۆنەکەی زەمانی جەنگی نێوانیانی هێنایەوە ناو، جائەوانیش لەماڵ چوونەدەرێ و، شیریان لەیەك کێشاو هەردوو ڕژانە گۆڕەپان، ئەوسا پێغەمبەریش ﷺ چووە نێوانیان وئامۆژگارییەکی زۆری کردن و فەرمووی: ((أَبِدَعْوَى الجاهلية، وأنا بينَ أظهُرِكُمْ؟)) پاشان ئایەتی: (یاأیهاالذین آمنوا إن تطیعوا فریقا من الذین أوتوا الکتاب..) هات و، پەشیمان بوونەوەو ئیتر زۆرگریان وچوونەوە سەرباری ئاسایی خۆیان, بەڵێ.. ڕاست وەستان لەسەر دینی ئیسلام و، پشت هەڵکردن لەکۆشکەکانی (کرملن)و (کۆشکی سپی و...هتد) خاڵێکی گەورەو پێویستە بەتایبەتی بۆئەمڕۆی موسڵمانان، زۆرپێویستە موسڵمانان بەزیرەکانە بژین، هەتا بەناوی نەتەوەو (مەزهەب)ەوە لەت وپەتیان نەکەن و، ژێرخانی ئابوورییان لەوە زیاتر وێران نەکەن، چونکە جوولەکەو فەلەو ئەڵقە لەگوێکانیان لەهەر جێگایەك بن, سەرکەوتنیان لەتەفرەقەی موسڵماناندا دەبیننەوە ، بۆیە دەبێ بەهیچ شێوەیەك رازی نەبین بەهیچ بەرنامەو نەخشەو پلانێك ئەوان بۆمان دابڕێژن، وەکو دەفەرموێ:
﴿[100] یاأیهاالذین آمنوا إن تطیعوا فریقا من الذین أوتوا الکتاب یردوکم بعد إیمانکم کافرین﴾ ئەی ئەوکەسانەی باوەڕتان هێناوە! ئەر ئێوە -پاش ئەوە باوەڕتان هێنا- گوێڕایەڵی لەدەستەیەکی دڵ پڕ لەڕقی خاوەن نامەکان بکەن، ئەوا کافرتان ئەکەن و لەدینی ئیسلام لاتان دەدەن, بەڵێ ئەمە هەرچەند لەوکاتەدا لەگەڵ (ئەوس) و (خەزرەج)ی بوو، بەڵام تا ڕۆژی قیامەت هەموو موسڵمانێك دەگرێتەوە.
﴿[101] وکیف تکفرون وانتم تتلی علیکم آیات الله وفیکم رسوله﴾ ئێوە چۆن بێ باوەڕ دەبن! خۆهەمیشە ئایەتەکانی خوا بەنیگا بۆتان دێن و، لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ بەسەرتاندا ئەخوێنرێنەوەو، خۆیشی هەر لەناوتاندایە ؟! ﴿ومن یعتصم بالله فقد هدی إلی صراط مستقیم﴾ دڵنیابن هەرکەسێك دەست بەدین و ئاییینی خواوەبگرێت، بەڕاستیی بۆ ڕێگا ڕاستەکەی ئیسلام، هیدایەت دراوەو ڕێنمایی کراوە.



وَكَيْفَ تَكْفُرُونَ وَأَنتُمْ تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ وَفِيكُمْ
رَسُولُهُۥ وَمَن يَعْتَصِم بِٱللَّهِ فَقَدْ هُدِىَ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٠١﴾
يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا ٱتَّقُوا ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم
مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ وَٱعْتَصِمُوا بِحَبْلِ ٱللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا
وَٱذْكُرُوا نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنتُمْ أَعْدَآءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ
فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِۦٓ إِخْوَٰنًا وَكُنتُمْ عَلَىٰ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ ٱلنَّارِ
فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ
﴿١٠٣﴾ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى ٱلْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ
وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَأُولَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٤﴾ وَلَا
تَكُونُوا كَٱلَّذِينَ تَفَرَّقُوا وَٱخْتَلَفُوا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ
وَأُولَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٠٥﴾ يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ
وُجُوهٌ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسْوَدَّتْ وُجُوهُهُمْ أَكَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ
فَذُوقُوا ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴿١٠٦﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱبْيَضَّتْ
وُجُوهُهُمْ فَفِى رَحْمَةِ ٱللَّهِ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿١٠٧﴾ تِلْكَ ءَايَٰتُ
ٱللَّهِ نَتْلُوهَا عَلَيْكَ بِٱلْحَقِّ وَمَا ٱللَّهُ يُرِيدُ ظُلْمًا لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠٨﴾



## بە هەقیانەت خوا بپەرستن:

﴿[102] یاأیهاالذین آمنوا اتقواالله حق تقاته﴾ ئەی گەلی خاوەن باوەڕ! دەبێ هەرچۆنێ پێویستە، ئاوا لەسنوورەکانی خوا پارێز بکەن.. هەمیشە گوێڕایەڵ بن، هەرگیز سەرپێچی نەکەن، هەردەم خواتان لەیادبێت، هیچ کات لەبیری نەکەن، سوپاسگوزار بن، سپڵە مەبن، لەسوورەتی (تەغابون: ١٦)دا هاتووەو دەڵێ: (فاتقواالله ماستطعتم) بەڵێ لەخوا ترسان بەپێی توانایە، ڕاستە، دەبێ هەتا گیانمان لەبەردابێ، لەخوا بترسین و بەرفەرمانی

ئەو بین، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ولا تموتن إلا وأنتم مسلمون﴾ و دەبێ هەر بەموسڵمانێتی بمرن، واتە: هەتا زیندوون توند دەست بە ئیسلامەکەتانەوە بگرن و، دەستی لێ بەرمەدەن، هەتا ڕۆژێ کەمردن با بەدینەوە بچنەوە لای خوا.

**هەموو بەدینی خواوە دەس وەرێنن:**

﴿[١٠٣] واعتصموا بحبل الله جميعا ولا تفرقوا﴾ بەتێکڕا گشتتان دەست بە رشتەی ئایینی خواو قورئانەکەیەوە بگرن و، قەت لێی نەترازێن و، کارێکیش مەکەن ببێتە هۆی پەرت بونتان و، دەرەنجامیش دەستەدەستەو کۆمەڵ کۆمەڵ، لێی راوەستن و، تۆزتان بەحەوادا بچێت، بۆیە خوا لەجێگایەکی تردا جەخت لەسەر ئەومەبەستە دەکاتەوەو دەفەرموێ: (وأطيعواالله ورسوله ولاتنازعوا فتفشلوا وتذهب ريحكم واصبروا إن الله مع الصابرين) فتح الباري: ٥٠٤٨/٨ . بێگومان لەسەرەتای ئیسلامەوە هەرئەو وەحدەت ویەکریزییە بوو، موسڵمانان توانییان لەماوەی (٣٠) ساڵدا بەرێژەیەکی کەمەوە لەچاو سوپاو لەشکری کوفرەوە، گەلێ ناوچەو وڵاتی دنیا ئازاد بکەن، دەسا بائەمرۆش موسڵمانان یەکریز بن و قەت لێکنەترازێن ، هەتا خواش یارمەتیمان بداو سەرمانخات ﴿واذكروا نعمة الله عليكم﴾ نیعمەت وبەخششەکانی خوا وەبیر بێنن ﴿إذ كنتم أعداء فألف بين قلوبكم﴾ ئەودەمە کەئێوە -لە سەردەمی نەفامیدا- دژ بەیەکتر بوون، ئینجا خوای بەبەزەیی، هۆگریی وتەبایی خستە نێوان دڵەکانتانەوە ﴿فأصبحتم بنعمته إخوانا﴾ ئەوجا ئێستا بەهۆی بەخشش و میهرەبانی خۆیەوە بوونە براو کینەی چەندین ساڵە لەدڵتان دەرچوو، لەم ئایەتەدا باسی ئەوە نەکراوە کەئاخۆ ئەونەیاریی و دژایەتییە لەگەڵ یەکتردا چەندو چۆن بوو؟ بەڵام لەجێی تردا باسی دەکاو دەڵێ: گەیشتبوویە پلەیەکی وا خەریك بوو چارەسەر نەکرێت ئەگەر خوا نەیویستایە، وەك لەسوورەتی (ئەنفال: ٦٢-٦٣)دا هاتووە: (و إن يريدوا أن يخدعوك فإن حسبك الله هو الذى أيدك بنصره وبالمؤمنين * وألف بين قلوبهم لو أنفقت مافى الأرض جميعا ما ألفت بين قلوبهم ولكن الله ألف بينهم إنه عزيز حكيم). ﴿وكنتم على شفاحفرة من النار فأنقذكم منها﴾ ئەوکات ئێوە لەسەر لێواری چاڵێکی پڕ لەئاگردا بوون و رزگاری کردن لێی ﴿كذلك يبين الله لكم آياته﴾ خوا ئابەوشێوە جوانەیە ئایەتەکانی ڕوون ئەکاتەوە بۆتان ﴿لعلكم تهتدون﴾ بەشکو رێی راست بدۆزنەوەو ڕێنوێن بن.

**دەبێ کۆمەڵێ هەبن فەرمان بە چاکە بدەن و، ڕێ لە خراپە بگرن:**

﴿[١٠٤] ولتكن منكم أمة يدعون إلى الخير﴾ پێویستە هەمیشە کۆمەڵ ودەستەیەك لەئێوە ببێت ئەی موسڵمانان! مەردم بۆ رێی خێرو چاکە بانگ بکەن ﴿ويأمرون بالمعروف وينهون عن المنكر﴾ وفەرمان بەچاکە بدەن و، ڕێ لەخراپە بگرن ﴿وأولئك هم المفلحون﴾ دیارە ئەوانەن سەرفرازو بەختیارکە: بەلێبڕاوانە هەڵدەسن بەوکارە پیرۆزەو خۆیانی بۆ یەکلا ئەکەنەوەو، بەڕاستیی و دروستیی و، بێ ترس و لەرز لەکاربەدەستانی ڕۆژگار بەرنامەکەی خوا دەگەیەنن. پێغەمبەری رابەریشمان دەفەرموێ: ((مَنْ رَأى منكم مُنْكَرًا فَلْيُغَيِّرْهُ بيده، فإن لم يَسْتَطِعْ فبلسانه، وإن لم يستطع فبقلبه، وذلك أَضْعَفُ الإيمان)) یان ((وليس وراء ذلك من الإيمان حَبَّةُ خَرْدَلٍ)) موسلیم.

**پەرت مەبن و لێك مەترازێن:**

﴿[١٠٥] ولا تكونوا كالذين تفرقوا واختلفوا من بعد ماجاءهم البينات﴾ ئێوە وەك ئەوجوولەکەو گاورانە مەبن، کە دوای چەندین بەڵگەو نیشانەی ڕوون بۆیان هات، پەرتبوون و دووبەرەکییان تێکەوت و دژی یەکدی وەستان ﴿وأولئك لهم عذاب عظيم﴾ ئەوانە سزایەکی گەورەو گرانیان بۆهەیە، چونکە لێکترازان و دووبەرەکیی و دژایەتیی یەکتریان کردو، پێچەوانەی فەرمانەکەی خوا رەفتاریان کرد! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بێگومان خاوەن نامەکان

دینەکەیانیان شێواندو، بوونە (٧٢) دەستە، ئەم ئوممەتەش دەبنە (٧٣) دەستەو دەکەونە شوێنی هەواوئارەزووی خۆیان، جا تەنیا ئەوانەیان بەهەشتین، کە لێکناترازێن وپێکەوە کاردەکەن..)) پێشەوا ئەحمەد ﴿١٠٦ يوم تبيض وجوه وتسود وجوه﴾ لەڕۆژێکدا کەهەندێ کەس ڕووی سپیی دەبێ و، هەندێکیش ڕووڕەش دەبن ﴿فأما الذين اسودت وجوههم﴾ ئینجا ئەوانەی وا ڕووڕەش دەبن پێیان ئەوترێ:﴿اكفرتم بعد إيمانكم﴾ ئایا پاش باوەر هێنانتان کافر بوونەوە؟! ﴿فذوقوا العذاب بما كنتم تكفرون﴾ دەسا ئەمرۆ بەهۆی بێ باوەڕییتانەوە ئەم سزایە بچێژن، لەجێگایەکی تردا خوا ئەفەرموێ: (ويوم القيامة ترى الذين كذبوا على الله وجوههم مسودة) واتە: ئەوانە وابەدەم خواوە درۆیان کرد دەیانبینی ڕوویان ڕەشە، لەسوورەتی (یوونس:٢٧)دا هاتووە: (والذين كسبوا السيئات جزاء سيئة بمثلها وترهقهم ذلة ما لهم من الله من عاصم كأنما اغشيت وحوههم قطعا من الليل مظلما) وهۆی سزای قیامەتیان، کاری فەسادو خراپەی دنیایانە، وە لەسوورەتی (عبس: ٤٠-٤٢)دا هاتووە: (وجوه يومئذ عليها غبرة * ترهقها قترة، أولئك هم الكفرة الفجرة) هۆی سزایان بێ باوەریی و لەسنووردەرچوونە، ئەوشتانە لەبنەڕەتدا گشت یەک شتن، بەڵام بەچەند دەستەواژەیەکی جیاواز، لەقورئاندا هاتوون، لەسوورەتی (تاها: ١٠٥)دا (ونحشر المجرمين يومئذ زرقا) هاتووەکە: بەڕووی ڕەش وچاوی شین وەرگەڕاویانەوە حەشر دەکرێن و کۆدەکرێنەوە ﴿١٠٧ واماالذين ابيضت وجوههم﴾ ئەوانەشیان کەڕوویان سپی و گەش و جوانە ﴿ففي رحمة الله هم فيها خالدون﴾ بەهەتاهەتایی لەناو میهرەبانیی و بەهەشتی خوادان ﴿١٠٨ تلك آيات الله نتلوها عليك بالحق﴾ ئەمانە کە بەڕاستیی و دروستیی بۆت ئەخوێنینەوە، گشت ئایەتی خوان ﴿وماالله يريد ظلما للعالمين﴾ و خوایش هەرگیز ناهەقیی و ستەم لەجیهانیان ناکا، بڕیارەکانی گشت پڕن لەخێروچاکە بۆیان و، مەبەستیشی ڕێنماییانە، نەك ستەم.

لەڕێنماییەکانی ئایەتی (١٠٤ - ١٠٩):

١- دەبێ هەمووکات لەنێو ئوممەتی ئیسلامدا دەستەو تاقمێ بن کە ئوممەتانی تر بانگ بکەن بۆ دینی ئیسلام.

٢- ئەگەر هێرش کرایە سەرئیسلام، دەبێ ئەودەستە ئامادەیە بەرگری لێبکەن وجەنگیان لەگەڵ بکەن، هەروا لەهەموو شارو گوندێکا پێویستە ئەوکۆمەڵە دروست بکرێ.

٣- جیاوازی و ئیختیلاف حەرامە لەدیندا، ئەگەرچی ئێستا بەداخەوە موسڵمانان بەشێوەیەکی وا لێکترازاون ، فەرموودەکەی پێغەمبەریان ﷺ لەخۆیاندا جێکردۆتەوە کە: دەفەرمووێ: (تَفَرَّقَتِ اليَهُودُ على احدى وسبعين فرقة، أو سبعين فرقة، والنصارى مثل ذلك، وتَفَرَّقَتْ أمتِي على ثلاث وسبعين فرقة)، واتە: جوولەکە بوونە (٧٠) یان (٧١) دەستە، عیساییەکانیش هەروا، ئەم ئوممەتەی منیش دەبنە (٧٣) دەستە. (رواه الترمذی، وقال حديث صحيح). بەڵێ وابوو، چونکە هەر لەوسەردەمە نزیکانەدا موسڵمانەکان بوونە (٦) دەستە: (حەرورییە) قەرامییە، جەهمیە، مورجیئە، رافیزە، جەبریە)، دیسان هەریەکەش لەمانە بوویە (١٢) دەستەو، ئەوسا بەهەموویانەوە (٧٢) دستەکەیان تەواوکرد، دیارە کەئەمانە هەمووشیان دۆزەخین، تاقمی ئەهلی سوننەت وجەماعەت نەبێ، ئەوجار ئەگەر ئێستاش سەیرێکی نێودەوڵەتانی ناوچەکە بکرێ، دەبینرێ کەچۆن کراونەتە چەندین دەوڵەتۆکەو، حکومەتۆڵکەوە، دیارە کە دەرمان وچارەسەری ئەوحاڵەتەش تەنها ئەم فەرموودە صەحیحەیە: ((إن اللهَ يَرْضَى لكم ثلاثا: يرضى لكم أن تَعْبُدُوهُ ولا تُشْرِكوا به شيئاً، وأنْ تَعْتَصِمُوا بحبل الله جميعا ولا تَفَرَّقُوا، وأنْ تَناصَحُوا مَنْ وُلّاهُ الله امركُمْ، ويَكْرَهُ لكم قِيلَ وقَالَ، وكثْرةَ السؤال، و إضاعةَ المال)). خوا لەسێ شت ڕازییەو، لەسێ شت تووڕەیە: ڕازییە بیپەرستن و، هیچ شتێك نەکەنە هاوبەشی، حەزدەکا سەرجەم دەستتان بەدینەکەی ئەوەوە بێ و لێکنەترازێن، حەز دەکا هەرکەس

دەبێتە (ئەمیر)تان دڵسۆزی بن، ڕقیشی لەسێ شت دەبێتەوە: گوتی، گوتی و قسەی بێ جێ، داواو پرسیاری نابەجێ، سەرفی ماڵ بەهەڵە (خەرجی) ، بەڵێ خەڵکانی بیدعەچی و، پەیڕەوانی هەواو ئارەزوو لەقیامەتدا ڕوویان ڕەشە. ئەهلی سوننەت وجەماعت: هەر ئەوکەسانەن کەلەبارەی (عقیدە)و (عیبادات)ەوە، بەو بەرنامەیە کاردەکەن کەپەیامبەرو هاوەڵانی لەسەری بوون، بێگومان ئەمانە لەڕۆژی قیامەتدا ڕوویان سپی دەبێ، پەیامبەر ﷺ ئەفەرموێ: ((إفترقت اليهود الى احدى وسبعين فرقه، وإفترقت النصارى على أثنتين و سبعين فرقة، و ستفترق هذه الملة إلى ثلاث وسبعين فرقة كلهن في النار إلا واحدة فى الجنة، وقيل من هم يارسول الله ﷺ ؟ فقال: هم الذين يكونون على ما أنا عليه و أصحابى).

٤- ئەنجامی گشت کاروبارێکی دنیاو قیامەت هەرلای خوایە.

﴿[١٠٩] ولله مافى السموات وما فى الأرض﴾ هەرچی لەئاسمانەکان و زەوییدایە، گشت هەرموڵکی خوایە، چۆن بیەوێ ئاڵووگۆڕی تیابکات ئەیکات ﴿وإلى الله ترجع الأمور﴾ ئەنجامی تەواوی کارەکانیش هەر بۆلای خوا ئەگەڕێنرێتەوە، بۆخۆی حاکمی دنیاو قیامەتە.

**باوەڕدارانی ئەم دینە لە هەموان چاکترن:**

﴿[١١٠] كنتم خير امة اخرجت للناس﴾ ئێوە چاکترین ئوممەت و کۆمەڵن، هێنراونەتە ئەم سەر زەوییە بۆ کەڵك گەیاندن بەمەردم و ڕێنمایی کردنیان ﴿تامرون بالمعروف وتنهون عن المنكر وتؤمنون بالله﴾ بۆیە فەرمان بەچاکە دەدەن و، ڕێ لەکاری خراپەو شیرك دەگرن و باوەڕیشتان بەخوا هەیە، بەڵام گەلانی تر، وەك ئێوە ئەم سیفەتانەیان گشت تێدانییە. پێشەوا (عومەر) فەرمووی: ئەوکەسەی پێی خۆشە لەم ئوممەت و کۆمەڵی ئیسلامە بێت، دەبێ باوەڕی بەخوا هەبێ و، فەرمان بەچاکە بداو ڕێ لەخراپە بگرێت ﴿ولو آمن أهل الكتاب لكان خيرا لهم﴾ ئەگەر خاوەن کتێب ونامەکانیش باوەڕێکی ڕاستەقینەیان بە پێغەمبەر هێنابا، ئەوەیان بۆ چاکتربوو بەلای خواوە لەئیمانی چەوتو ناڕاست ﴿منهم المؤمنون واكثرهم الفاسقون﴾ ئەوانیش هەیانە وەك (عەبدوڵلای کوڕی سەلام) باوەڕی بەپێغەمبەر هەیەو ئیماندارن، بەڵام زۆربەشیان لەسنووری خوا دەرچوون و سنووریان شکاند، ئەگەرچی خۆیشیان بەباوەڕدار بزانن ﴿[١١١] لن يضروكم إلا اذى﴾ هەرگیز ناشتوانن جۆرە زیانێکتان پێبگەیەنن ، مەگین هەربە زمان وقسەی ناخۆش و نابەجێ ونەشیاو ﴿وإن يقاتلوكم يولوكم الأدبار﴾ ئەگەر لەگەڵیشتان کوشتار بکەن ، زۆر زوو پشتتان تێدەکەن وهەڵدێن وگۆڕەپان چۆڵ دەکەن ﴿ثم لاينصرون﴾ پاشانیش بەهیچ شێوەیەك یارمەتی نادرێن و ناتوانن سەرکەون بەسەرتاندا، چونکە ئێوە (خير أمة)ن ﴿[١١٢] ضربت عليهم الذلة اينما ثقفوا﴾ لەهەرچێیەکیش بن زەلیل و ڕیسواو ژێر چەپۆکن، هەرگیز ڕزگار نابن لێی و

سُورَةُ آلِ عِمۡرَانَ — الجزء الرابع

وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ
﴿١٠٩﴾ كُنتُمۡ خَيۡرَ أُمَّةٍ أُخۡرِجَتۡ لِلنَّاسِ تَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ
وَتَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَتُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِۗ وَلَوۡ ءَامَنَ
أَهۡلُ ٱلۡكِتَٰبِ لَكَانَ خَيۡرٗا لَّهُمۚ مِّنۡهُمُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ
وَأَكۡثَرُهُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴿١١٠﴾ لَن يَضُرُّوكُمۡ إِلَّآ أَذٗىۖ
وَإِن يُقَٰتِلُوكُمۡ يُوَلُّوكُمُ ٱلۡأَدۡبَارَ ثُمَّ لَا يُنصَرُونَ ﴿١١١﴾ ضُرِبَتۡ
عَلَيۡهِمُ ٱلذِّلَّةُ أَيۡنَ مَا ثُقِفُوٓاْ إِلَّا بِحَبۡلٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَحَبۡلٖ مِّنَ ٱلنَّاسِ
وَبَآءُو بِغَضَبٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَضُرِبَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلۡمَسۡكَنَةُۚ ذَٰلِكَ
بِأَنَّهُمۡ كَانُواْ يَكۡفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَيَقۡتُلُونَ ٱلۡأَنۢبِيَآءَ بِغَيۡرِ
حَقّٖۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَواْ وَّكَانُواْ يَعۡتَدُونَ ﴿١١٢﴾ ۞ لَيۡسُواْ سَوَآءٗۗ حزب ٧
مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ أُمَّةٞ قَآئِمَةٞ يَتۡلُونَ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ ءَانَآءَ ٱلَّيۡلِ
وَهُمۡ يَسۡجُدُونَ ﴿١١٣﴾ يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ
وَيَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَيُسَٰرِعُونَ
فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِ وَأُوْلَٰٓئِكَ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١١٤﴾ وَمَا يَفۡعَلُواْ
مِنۡ خَيۡرٖ فَلَن يُكۡفَرُوهُۗ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِٱلۡمُتَّقِينَ ﴿١١٥﴾

٦٤ إِنَّ ٱلَّذِينَ

لەکۆڵیان نابێتەوە ﴿إلا بحبل من الله وحبل من الناس﴾ مەگەر هەر لەسایەی ئایینی خوا، واتە: هەرکاتێ ملکەچی ئیسلام و بەرنامەکەی خوا بوون، ئەوا لەژێر چەپۆکی دێنە دەرو، بەرێزەوە مافەکانیان بۆ جێبەجێ دەکرێ ، یان مەگەر پەیمان لەگەڵ خەڵکدا بگاتە فریایانو بەیەکەوە ژیان بەسەر بەرن، واتە: هەرکاتێ سەرانەیاندا، ئیتر بەرێزەوە بۆخۆیان دادەنیشن، ئەگەرچی هەندێ دەڵێن: مەبەست بە (بحبل من الناس) ئەوەیە کە لەژێر رکێفی پەنادەرێکا بن، وەك ئێستا کە هەرچی رازو نیازیانە بەدەستی ئەمریکایەو سەرشۆڕو ریسوای ئەون ﴿وباؤا بغضب من الله﴾ بە خەشم و قینێکی زۆری خواوە گەڕانەوە ﴿وضربت عليهم المسكنة﴾ مۆری بێ چارەیی و ریسوایی و ژێردەستەییان بەسەرا درا ﴿ذلك بأنهم كانوا يكفرون بآيات الله﴾ چونکە ئینکاریی و نکووڵی ئایەتەکانی خوایان دەکرد ﴿ويقتلون الأنبياء بغير حق﴾ و بەناهەق پەیامبەرانیشیان دەکوشت! ﴿ذلك بما عصوا وكانوا يعتدون﴾ بەردەوام هەرافەرمانی و سەرپێچیان دەکردو لەسنوور دەردەچوون.

**ئەهلی کتێب هەموو وەك یەك نین:**

﴿١١٣ ليسوا سواء﴾ خاوەن نامەکان لەوسیفەتانەدا هەموو وەك یەك نین ﴿من أهل الكتاب أمة قائمة﴾ چونکە لەخاوەننامەکاندا کۆمەڵی وایان هەیە لەسەر فەرمانی خوا دامەزراون و، فەرمانەکانی بەرێکی جێبەجێ دەکەن ﴿يتلون آيات الله آناء الليل وهم يسجدون﴾ وروو لەخوان وهەردەم ئایەتەکانی خوا بەشەودا دەخوێننەوەو، خەریکی نوێژ و کڕنووش بردنن بۆخوا, لەسوورەتی (بەقەرە: ١٢١) دا هاتووە: (الذين آتيناهم الكتاب يتلونه حق تلاوته أولئك يؤمنون به) واتە: بەڕاستیی و بەهەق ئەوانە تەورات دەخوێنن، کە بڕوایان پێی هەیە. وە لەسوورەتی (ئالی عیمران: ١٩٩)دا هاتووە: (وإن من أهل الكتاب لمن يؤمن بالله وماأنزل إليكم وماأنزل إليهم خاشعين لله لايشترون بآيات الله ثمنا قليلا) واتە: باوەڕیان بەخواو قورئان وتەورات هەیەو، هەرگیز بەرنامەو ئایەتەکانی خوا بەبەهایەکی کەم ناگۆڕنەوە. لەسوورەتی (رەعد: ٣٦)دا هاتووە: (والذين آتيناهم الكتاب يفرحون بما أنز ل إليك) کە بەقورئان زۆر دڵخۆش دەبن. لەسوورەتی (ئەنعام: ١١٤)دا هاتووە: (والذين آتيناهم الكتاب يعلمون أنه منزل من ربك بالحق) چاك دەزانن کە قورئان ڕاست ودروستە، لەسوورەتی (ئیسراء: ١٠٧، ١٠٩)دا هاتووە: (إن الذين أوتوا العلم من قبله إذا يتلى عليهم يخرون للأذقان سجدا) هەرکە قورئانیان بۆ دەخوێنرێتەوە، بەڕوودا دەکەون و دەگرین، وە لەسوورەتی (مائیدە: ٨٣) دا ئەفەرموێ: (وإذا سمعوا ما أنزل إلى الرسول ترى أعينهم تفيض من الدمع مما عرفوا من الحق) هەرکە قورئان ئەبیسن بەکوڵ دەگرین ودڵیان پڕئەبێ لەترسی خوا ﴿١١٤ يؤمنون بالله واليوم الآخر﴾ باوەڕیان بەخواو بەرۆژی سەلاً هەیە ﴿ويأمرون بالمعروف وينهون عن المنكر﴾ و فەرمان بەچاکە دەدەن و ڕێ لەخراپە دەگرن ﴿ويسارعون في الخيرات﴾ و بۆ ئەنجامدانی گشت کارێکی خێر لەناویەکتردا تیژرەویی و تالووکەیانە ﴿أولئك من الصالحين﴾ ئائەوانەن لەریزی پیاوچاکاندان ﴿١١٥ وما يفعلوا من خير فلن يكفروه﴾ هەر کارێکی خێریش بکەن، قەت لێیان ون ناکرێ و، بێ بەش نابن و لای خوا پاداش ئەدرێنەوە ﴿والله عليم بالمتقين﴾ و خوایش بەپارێزکاران زاناو بەئاگایە، کردەوەی هیچ کەسێك لای ئەو نادیارو پەنهان نییە ﴿١١٦ إن الذين كفروا لن تغني عنهم أموالهم ولا أولادهم من الله شيئا﴾ ئەوکەسانەی کافرو بێ باوەڕن، ماڵ ومناڵیان هیچ شتێکیان لێ ناگێڕێتەوەو، لەسزای خوا بێ نیازیان ناکا هەرچەندە لەپێناویاندا خۆیان ماندوو کردبێت ﴿وأولئك أصحاب النار هم فيها خالدون﴾ هاوڕێ و، یاری ئاگری دۆزەخ هەرئەوانەن و، بە هەمیشەش تێیدان ﴿١١٧ مثل ما ينفقون في هذه الحياة الدنيا كمثل ريح فيها صر﴾ نموونەی ئەو پوول و داراییەی ئەو بێباوەڕانە لەم ژیانەی دنیایەدا بەڕییاو ڕووبینی دەیبەخشن بۆئەوەی خەڵکی

باسیان بکاو ناوو شۆرەت دەربکەن، وەکو باو گەردەلوولێکی وشککەرو سووتێنەر وایە ﴿أصابت حرث قوم ظلموا انفسهم فأهلکته﴾ کە لە کشت و مەزرای ئەوکەسانە بدات ستەمیان لەخۆیان کردووەو سەرپێچیان لەفەرمانەکانی خوا کردبێ، جا باکەیش هەموو کشتوکاڵەکە لەناوبەرێ و، هیچ سوودێکی لێوەرنەگرن، هەر ئابەوشێوەیەش خوای گەورە کاروکردەوەی بێباوەڕەکان بەهۆی کوفرو تاوانەکانیانەوە دەسڕێتەوەو بێ سوود ئەبێت بۆیان ﴿وما ظلمهم الله ولکن انفسهم یظلمون﴾ وخوا – لەوە کە لەڕۆژی قیامەتدا کردەوەکانیان بێ کەڵك دەبێ– ستەمی لێ نەکردوون، کەئاوای لێکردبن، بەڵکو خۆیان ستەمیان لەخۆیان کرد، چونکە باوەڕیان بەخوا نەبوو، لەرێگەیەکی بێ نرخیشدا ماڵ و سامانەکەیان بەخت کرد.

الجزء الرابع — سُورَةُ آلِ عِمۡرَانَ

إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَن تُغۡنِيَ عَنۡهُمۡ أَمۡوَٰلُهُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُهُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيۡـٔٗاۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿١١٦﴾ مَثَلُ مَا يُنفِقُونَ فِي هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا كَمَثَلِ رِيحٖ فِيهَا صِرٌّ أَصَابَتۡ حَرۡثَ قَوۡمٖ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فَأَهۡلَكَتۡهُۚ وَمَا ظَلَمَهُمُ ٱللَّهُ وَلَٰكِنۡ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ﴿١١٧﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ بِطَانَةٗ مِّن دُونِكُمۡ لَا يَأۡلُونَكُمۡ خَبَالٗا وَدُّواْ مَا عَنِتُّمۡ قَدۡ بَدَتِ ٱلۡبَغۡضَآءُ مِنۡ أَفۡوَٰهِهِمۡ وَمَا تُخۡفِي صُدُورُهُمۡ أَكۡبَرُۚ قَدۡ بَيَّنَّا لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِۖ إِن كُنتُمۡ تَعۡقِلُونَ ﴿١١٨﴾ هَٰٓأَنتُمۡ أُوْلَآءِ تُحِبُّونَهُمۡ وَلَا يُحِبُّونَكُمۡ وَتُؤۡمِنُونَ بِٱلۡكِتَٰبِ كُلِّهِۦ وَإِذَا لَقُوكُمۡ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوۡاْ عَضُّواْ عَلَيۡكُمُ ٱلۡأَنَامِلَ مِنَ ٱلۡغَيۡظِۚ قُلۡ مُوتُواْ بِغَيۡظِكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿١١٩﴾ إِن تَمۡسَسۡكُمۡ حَسَنَةٞ تَسُؤۡهُمۡ وَإِن تُصِبۡكُمۡ سَيِّئَةٞ يَفۡرَحُواْ بِهَاۖ وَإِن تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ لَا يَضُرُّكُمۡ كَيۡدُهُمۡ شَيۡـًٔاۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعۡمَلُونَ مُحِيطٞ ﴿١٢٠﴾ وَإِذۡ غَدَوۡتَ مِنۡ أَهۡلِكَ تُبَوِّئُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ مَقَٰعِدَ لِلۡقِتَالِۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٢١﴾

٦٥

**بێجگە لە موسڵمانان ، کەس مەکەنە هامڕازتان:**

﴿[118] یاایهاالذین آمنوا لا تتخذوا بطانة من دونکم﴾ ئەی ئەوانەی باوەرتان هێناوە! بەدەر لەخۆتان، کەسێك مەگرنە دۆست و مەیکەنە جێی رازونیازی خۆتانو، نهێنیەکانی خۆتانیان لا بدرکێنن ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((خوا هەر پێغەمبەریکی ناردبێ، یان هەر خەلیفەیەکی دانابێ، دووهاوڕازی بۆداناوە: هاوڕازێکیان فەرمانی چاکەی پێدەکاو دنەی دەدا لەسەریی، ئەویکەشیان کاری خراپەی خستۆتە بەردەمیی و هانیداوە لەسەریی، ئیتر مەر خوا مرۆڤ بپارێزێ)) فتح الباری. ﴿لا یألونکم خبالا﴾ لەکار تێکدان و زیان پێگەیاندنتان, درێغ ناکەن و کۆڵنادەن ﴿ودوا ما عنتم﴾ پێیان خۆشەو ئاواتیانە ئێوە هەر لەدەردو ئازاردا بن ﴿قد بدت البغضاء من أفواههم وما تخفی صدورهم أکبر﴾ جگە لەوەش کە بەئاشکرا دژایەتیتان دەکەن، هێمان ئەو رق و قینەیەش لەدڵیاندا دەیشارنەوە فرەترو گەورەترە لەوەی کەبەزاریاندا دێ ، دڵیان پڕە لەپیلان و فڕوفێڵ بەرامبەرتان ﴿قد بینا لکم الآیات﴾ ئێمە نیشانەو بەڵگەی زۆرمان بۆ رۆشنکردەوە، هەتا بەوئایەتانە دۆست ودوژمن لێك بکەنەوە ﴿إن کنتم تعقلون﴾ ئەر ئێوە تێبفکرێن و دەرکی راستییەکان بکەن، ئەزانن کێ بگرنە دۆستو هاوراز، بەڵێ زۆر گرنگە موسڵمانان دۆست و نەیاری خۆیان بناسن، زۆریش پێویستە کاروباری خۆیان نەخەنە بەردەس دوژمنانی دینی خوا، زۆریش مەبەستە نەکرێنە هاورازو کاروباری نهێنی و ئاشکرای موسڵمانان بزانن ﴿[119] هاانتم اولاء تحبونهم ولا یحبونکم﴾ ئاگاداربن ئەی کۆمەڵی باوەڕداران! ئێوە دووڕووەکانتان خۆش دەوێ، کەچی ئەوان قەت ئێوەیان خۆش ناوێ ﴿وتؤمنون بالکتاب کله﴾ ئێوە باوەڕتان بەکتێبەکەی خۆتان و، بەکتێبەکەی ئەوانیش هەیە، کەچی ئەوان وانین ! لەسوورەتی (شوورا: ١٥)دا هاتووە: (وقل آمنت بما أنزل الله من کتاب)، وە لەسوورەتی (بەقەرە: ٢٨٥)دا ئەفەرموێ: (.. کل آمن بالله وملائکته و کتبه ورسله..) واتە: هەموو باوەڕدارن بەگشت کتێبەکانی خوا، نەك تەنها بەقورئان باوەڕیان هەبێ ﴿وإذا لقوکم

قالو آمنا﴾ کاتێکیش پێتان بگەن -بەدووڕوویی و ناپاکی خۆیان- دەڵێن: باوەڕمان هێناوە. ﴿وإذا خلوا عضوا علیکم الأنامل من الغیظ﴾ کە تەنیا دەبن و لێتان دووردەکەونەوە، لەبەر رکی خۆیان سەرپەنجەیان دەگەزن، واتە: زۆر رقیان لێتانە ﴿قل موتوا بغیظکم﴾ ئەی پێغەمبەر! ﷺ بڵێ: دەك بەو دەردو رقەتانەوە بمرن، چونکە هەرنیعمەتی خۆی تەواودەکات بۆموسڵمانان ﴿إن الله علیم بذات الصدور﴾ بەراستیی خوا بەو نهێنییەی ناودڵیان زۆر زانایە، ئەزانێ چ پیلانێك بەرامبەر بەموسڵمانان لەسینگیاندایە ﴿١٢٠ إن تمسسکم حسنة تسؤهم﴾ ئەرچاکەو، خێرێکتان - وەکو دەستکەوتی جەنگیی، یان سەرکەوتن- تووش ببێ، پێی ناڕەحەت دەبن و، خەفەت ومەراقی زۆری پێدەخۆن ﴿وإن تصبکم سیئة یفرحوا بها﴾ خۆئەر نارەحەتی و ناخۆشییەکتان تووش ببێ، ئەوان پێی کەیفخۆش دەبن ﴿وإن تصبروا وتتقوا لا یضرکم کیدهم شیئا﴾ وئەگەر ئێوە ئەی موسڵمانان! لەبەرامبەر هەر ناڕەحەتیەك بێتە ڕێتان بەئارامبن و، لەشکاندنی سنوورەکانی خوا خۆ بپارێزن، ئەوا فڕو فێڵەکەیان هیچ زیانێکتان پێناگەیەنێت ﴿إن الله بما یعملون محیط﴾ بێگومان خوا دەورەی هەموپیلان کردەوەکانی داون و ئاگادارە پێیان.

## غەزای ئوحود:

ئاگاداریی: لەئایەتی (١٢١)ەوە هەتادەگاتە ئایەتی (١٨٠)ی ئەم سوورەتە، واتە: (٦٠) ئایەتی تەواو، سەبارەت بەجەنگی (ئوحود) هاتوون.. شیاوی ئاماژە بۆکردنە، جەنگی (ئوحود) لەساڵی سێیەمی کۆچیدا روویدا، جابەم شێوەیەش ڕوداوەکە دەس پێدەکاو دەفەرموێ: ﴿١٢١ وإذ غدوت من أهلك﴾ ئەوکاتە وەبیر بێنە ئەی پێغەمبەر ﷺ! کە لەبەرەبەیاندا ماڵ و منداڵی خۆتت جێهێشت و چوویتە دەرێ بەرەو ئوحود، ئەورۆژە ڕۆژی بەرەبەیانی شەممەو، (٧)ی شەشەلانی ساڵی سێیەمی کۆچی بوو، پەیامبەر ﷺ لەودەمەدا بەخەو دیتبووی کە: شیرەکەی پارچەیەکی لێبۆتەوەو، مانگایەکیشی بۆسەربڕاوەو، دەستیشی بە زرێیەکی تۆکمەو مەحکەمەوە گرتووە.. دوایی وای لێکدایەوە کەچەند کەسێك لە خزم و هاوەڵانی دەکوژرێن و، کەسێکی نزیکی خۆیشی لەوجەنگەدا پێوە دەبێ و، قەڵا مەحکەمەکەیش کەدەستی پێوەگرتبوو شاری مەدینەیە. ئیمامی (موسلیم) ریوایەتی کردووە ﴿تبوئ المؤمنین مقاعد للقتال﴾ پێگەی جەنگت بۆبڕوادارەکان دیاری دەکرد، پلانی جەنگ و جێگەی سەربازگەت بۆ ریك دەخستن، دەستە دەستەت دەکردن، جێگەی تیروەشێن و، جێگەی ئەسپ سوارو هەروەها.. ﴿والله سمیع علیم﴾ و خوا زۆر ژنەوایە بۆ قسەکانتان کە: مەشوەرتت پێدەکردن و ئەوان چییان پێدەگوتی، زۆر زانایە، دەزانێ چی باشە بۆتان ﴿١٢٢ إذ همت طائفتان منکم أن تفشلا﴾ کە لەوکاتەدا خەریك بوو دوودەستەتان ئەی موسڵمانەکان! لاوازو سست بن و ورە بەردەن و هەڵبێن، ئەوسا پەیامبەر ﷺ بە (یەك هەزار) کەسەوە لەمەدینەوە بەرەو ئوحود چوو، جا لەسەربازگەی بێ باوەڕەکانەوە نزیکبوونەوەو بیستتان کە بێ باوەڕەکان (سێ هەزار) کەسن، ئیتر ئەو دووهۆزەی (بەنی سەلەمە)و (بەنی حاریسە) خاوبوونەوەو، ویستیان بەجێت بێڵن و ڕابکەن ﴿والله ولیهما﴾ بەڵام خوای سازکارو سەرپەرشتیکار، بەهانایانەوە هات و سەرەنجام سەریخستن بەسەر دوژمنداو نەیهێشت ورەیان بڕوخێ. بوخاریی دەڵێ: جابری کوڕی عەبدوڵڵا -خوا لێی رازی بێ- دەڵێت: ئەم ئایەتەی: (اذ همّت طائفتان منکم ان تفشلا..) لەبارەی ئێمە (دووتیرەکەی: کوڕانی حاریسەو، کوڕانی سەلەمە)وە هات، وە لەبەرئەوە کەخوا پێمان فەرموو: (والله ولیهما..) خوا دۆست وسەرپەرشتیاریانە، هەرگیز حەزم نەدەکرد، نەهاتبایەتە خوارەوە! لەبەرئەوە گوایا نهێنی ئێمە دەخاتەڕوو!. ﴿وعلی الله فلیتوکل المؤمنون﴾ دەبا باوەڕداران تەنها بەخواپشت ببەستن ، دوای ڕێکخستنی هۆ جەنگییەکان.

### بەدرتان لەبیربێ، کەمیشبوون و خواش سەریخستن:

﴿[١٢٣] **ولقد نصركم الله ببدر وانتم اذلة**﴾ بێ سۆ لەڕۆژی (بەدر)دا خوا بەسەر دوژمندا سەریخستن و، ناتەواوو کەم و بێ دەسەلاَت و کزولاوازیشبوون، بەلاَم چونکە (صەبر)و (تەقوا)تان هەبوو، خوا سەریخستن، ئێستایش ئەر هەروا بمێننەوە، خوا هەر سەرتان دەخات ﴿**فاتقوا الله لعلكم تشكرون**﴾ دەساهەر لەخوا بترسن و خۆبپارێزن ، بەڵکو بتوانن شوکری بکەن. ڕووداوی بەدر، ڕۆژی هەینی و، (١٧)ی مانگی ڕەمەزانی ساڵی دووەمی کۆچیی بوو، ژمارەی موسڵمانەکان لەوجەنگەدا (٣١٣) کەس بووو، دوژمنیش -بەهەموو پێداویستییەکی جەنگیی ئەوڕۆژەوە- نزیکەی هەزارکەس بوو، لەگەڵ ئەوەشدا خوا هەر سەریخستن، هەتا بزانن کەسەرخستن بەدەستی خوایە، بییەوێت ئەگەرچی پێداویستیشتان ناتەواوبێت، سەرتان دەخات، لەئایەتێکی تردا خوا دەفەرموێ: (ويوم حنين إذ اعجبتكم كثرتكم فلم تغن عنكم شيئا..).

### فریشتە لە ئوحودا هاتنە یارییتان:

ڕاڤەکەرانی قورئان قسەیان جیاوازە کە: بەڵێنەکەی خوا بەناردنی فریشتە بۆ هاوکاریی موسڵمانەکان، ئاخۆ ڕۆژی بەدربوو، یان ئوحود؟ (ئیبن جەریر) ڕۆژی بەدەر پەسەند دەکاو پێی وایە ئەر لەئوحودا بەشدارییان کردبا، موسڵمانەکان نەدەشکان، لەولایشەوە هاوبەشی فریشتە بەسراوە بەصەبرو ئارامی ئەوانەوە، خۆئەوان صەبرو ئارامیان نەبوو، هەتا خوا فریشتە بنێرێ بۆهاوکارییان ﴿[١٢٤] **إذ تقول للمؤمنين الن يكفيكم ان يمدكم ربكم بثلاثة آلاف من الملائكة منزلين**﴾ ئەودەمە وەبیربێنە ئەی پێغەمبەرﷺ! (ڕۆژی بەدەر، یان ئوحود) کە بەباوەڕدارەکانت دەگوت: ئاخۆ ئەوەندەتان بەس نەبێ کە: پەروەردگارت لە فریشتەکانی خۆی (سێ هەزار) بنێرێتە خواریٚ بۆهاوکاریتان، واتە: هێشتای بەو حاڵەتەشەوە، لەبەر کەمیتان ورەتان نەمابوو. تەفسیر نووس و مێژوو نووسەکان لەوەدا هاودەنگن کەخوا لەوڕۆژەدا فریشتەی ناردو جەنگیشیان کرد، (ئەسەر)ێکی زۆرییش هاتووە کە فریشتە بە مێزەرەی سپی و ڕەش و زەردەوە چوونە ناوگۆڕەپانی جەنگەوە. (ئەبوداودی مازنیی) دەڵێت: لەجەنگی (بەدر)دا کەوتمە دوای کابرایەك تا لەملی بدەم، جاپێش ئەوە من بیگەمێ ، دیتم سەری پەڕی و هیچ کەسێکیش لەپێشمەوە نەبوو. ﴿[١٢٥] **بلى إن تصبروا وتتقوا**﴾ بەڵێ ئەو ئەندازەیە بەسە، ئەرئێوە خۆڕاگربن و لەسنوورەکانی خوا پارێز بکەن ﴿**وياتوكم من فورهم هذا**﴾ وخۆ لەم کاتەدا پەلامارتان بدەن ﴿**يمددكم ربكم بخمسة آلاف من الملائكة مسومين**﴾ پەروەردگارتان بەپێنج هەزار فریشتەی نیشانەدار کۆمەکتان دەکات. (ئیبن زوبەیر) دەڵێت: (مسومين) بەواتای بەدروشم و بەناوونیشانی دیاریکراوەوە دێنە لاتان: مێزەرەو عەمامەیان زەردەو، لوفکە بەنێوشانیاندا بەربۆتەوە. (ئیبن جەریر) دەڵێت: بەڵگەی بەشداری

سُورَةُ آلِ عِمۡرَانَ — الجُزءُ الرَّابِع

إِذۡ هَمَّت طَّآئِفَتَانِ مِنكُمۡ أَن تَفۡشَلَا وَٱللَّهُ وَلِيُّهُمَاۗ وَعَلَى
ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴿١٢٢﴾ وَلَقَدۡ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ بِبَدۡرٖ وَأَنتُمۡ
أَذِلَّةٞۖ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴿١٢٣﴾ إِذۡ تَقُولُ لِلۡمُؤۡمِنِينَ
أَلَن يَكۡفِيَكُمۡ أَن يُمِدَّكُمۡ رَبُّكُم بِثَلَٰثَةِ ءَالَٰفٖ مِّنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ
مُنزَلِينَ ﴿١٢٤﴾ بَلَىٰٓۚ إِن تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ وَيَأۡتُوكُم مِّن فَوۡرِهِمۡ
هَٰذَا يُمۡدِدۡكُمۡ رَبُّكُم بِخَمۡسَةِ ءَالَٰفٖ مِّنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ مُسَوِّمِينَ
﴿١٢٥﴾ وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشۡرَىٰ لَكُمۡ وَلِتَطۡمَئِنَّ قُلُوبُكُم بِهِۦۗ وَمَا
ٱلنَّصۡرُ إِلَّا مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَكِيمِ ﴿١٢٦﴾ لِيَقۡطَعَ طَرَفٗا
مِّنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَوۡ يَكۡبِتَهُمۡ فَيَنقَلِبُواْ خَآئِبِينَ ﴿١٢٧﴾ لَيۡسَ لَكَ
مِنَ ٱلۡأَمۡرِ شَيۡءٌ أَوۡ يَتُوبَ عَلَيۡهِمۡ أَوۡ يُعَذِّبَهُمۡ فَإِنَّهُمۡ ظَٰلِمُونَ
﴿١٢٨﴾ وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ يَغۡفِرُ لِمَن يَشَآءُ
وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١٢٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُواْ لَا تَأۡكُلُواْ ٱلرِّبَوٰٓاْ أَضۡعَٰفٗا مُّضَٰعَفَةٗۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ
لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿١٣٠﴾ وَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ ٱلَّتِيٓ أُعِدَّتۡ لِلۡكَٰفِرِينَ
﴿١٣١﴾ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ﴿١٣٢﴾

٦٦ — وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ

نەکردنی فریشتە لەجەنگی ئوحوددا، بەهێزترە، تا لەبەڵگەی بەشداری کردنیان ، چونکە مسوڵمانەکان ئارام وصەبریان نەبووو نافەرمانی پێغەمبەریان کرد، لەولاشەوە دڵنیابە ئەگەر بەشداریان کردبا، باوەڕداران تووشی ئەوهەموو کێشەو گروفتانە نەدەبوون و سەردەکەوتن، بەڵام فریشتە لەبەدردا بەشدارییان کرد ﴿١٢٦ وماجعله الله إلا بشرى لكم﴾ خوای کارجوان ئەوەیشی هەر بۆئەوە کرد: ببێتە مژدەیەك بۆئێوە ﴿ولتطمئن قلوبكم به﴾ وپێیشی دڵنیو بەئارامبن. واتە: بۆیە خوا فەرمووی: (ألن یکفیکم..) و فریشتەیش هاتن تا ببێ بەمژدە بۆتان و دڵیشتان ئەسوور ببێ و، ئیتر لەزۆری ژمارەی ئەوان نەترسن ﴿وما النصر إلا من عندالله العزيز الحكيم﴾ ئەگینە خۆ سەرکەوتن تەنها بەدەستی خوای باڵادەست و کارجوانە، بەهێزو فریشتەو هۆ ئەسباب نیە، چونکە ئەر بیەوێ سەرنانخات، بێ ئەوش سەرتان دەخات ﴿١٢٧ ليقطع طرفا من الذين كفروا﴾ خوا ویستی لەو ڕۆژەدا بەشێ لە بێ باوەڕان لەناو ببا، ئەوەبوو (٧٠) کەسیان – کە هەندێکیشیان ڕابەروسەرۆك بوون- کوژران , (٧٠) کەسیشیان دیلکران ﴿أو يكبتهم فينقلبوا خائبين﴾ یان بۆ ئەوە بیانشکێنێ و ریسوایان بکا ئەر نەکوژران ، ئەجا بەنائومێدی و خەجاڵەتەوە بگەڕێنەوە.

**ڕێنماییەکانی ئایەتی (١٢٤-١٢٧):**

١- (موجاهید)و (عیکرەمە)و هەندێ تر دەڵێن: ئایەتی: (إذ تقول للمؤمنين) پەیمان و بەڵێن بوو بەموسڵمانان کە: ئەگەر (صەبر) و (تەقوا)یان هەبێ خواش بەژمارەیەك لەفریشتە پشتیوانیان لێدەکا، ئەمەش لەبەدردا ئاشکراو ڕوون بوو، بەڵام لەئوحوددا نافەرمانیان لەفەرمانەکەی پەیامبەر ﷺ کرد، ئیتر ئەو هاوکاری و یارمەتییە نەهات و، ئەوانیش تێکشکان.

٢- بۆسەرکەوتن ئەگەرچی دەبێ، ژمارەی هاوسەنگ وچەك و تەقەمەنی پێویست هەبێ، بەڵام لەگەڵ گشت ئەمانەیشدا سەرکەوتن تەنیا هەربەدەستی خوایە, لە(بەدر)دا فریشتە لەدیمەنی مرۆدا بەواقیعی بەشداربوون وجەنگیان کرد. ﴿١٢٨ ليس لك من الأمر شئ أو يتوب عليهم﴾ تۆ هیچ کارێکت بەکاری ئەوانەوە نییە، چونکە یا تەوبەیان لێوەردەگرێ و موسڵمان دەبن ﴿أو يعذبهم﴾ وە یان ئازارو سزایان دەدات، ئەگەر بەردەوام بن لەسەر بێ باوەڕی ﴿فإنهم ظالمون﴾ چونکە بەراستیی ئەوانە ستەمکارن و، شایانی سزان. پێشەوا (موسلیم) دەڵێ: کاتێ لە (ئوحود)دا پەیامبەر ﷺ ددانی پیرۆزی شکاو ڕوخساری جوانی خوێناوی بوو، فەرمووی: ئاخۆ گەل و هۆزێ ئاوا دەم وچاوی پەیامبەرەکەیان خوێناوی بکەن, دەبێ چۆن بەختیارو سەرفرازبن، واتە: خوایە تۆڵەیان لێ بسێنە؟ ئیمامی (بوخاریی) دەڵێ: یەکەیەکە ناوی دەهێنان، پێشەوا(ئەحمەد) دەڵێ: لەناویاندا ناوی ئەم سێ کەسەی هێنا: (حاریس، سوهەیل، صەفوان) دەرەنجامیش تەوبەیانکردو گەڕانەوە ﴿١٢٩ ولله مافى السموات وما فى الأرض﴾ هەرچی لە ئاسمانەکان ولەزەوییدایە، هەر موڵکی خوایەو خۆی باڵادەستە ﴿فيغفر لمن يشاء و يعذب من يشاء﴾ حەز بکا لەهەرکەسێك ببورێ شیاویش بێت، دەبورێ , لەهەرکەسیش حەزبکاو شیاوبێت, سزای ئەدا ﴿والله غفور رحيم﴾ وخوا زۆرلێبوردەو میهرەبانە.

**سوود خواردن ( زۆر و کەمیی ) حەرامە :**

﴿١٣٠ ياأيهاالذين آمنوا لا تأكلوا الربا أضعافا مضاعفة﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! سوود، چین لەسەرچین مەخۆن و وەری مەگرن، وەك سەردەمی نەفامی, دەچوون بۆ نموونە: (١٠٠) دیناریان ئەدا بە (٣٠٠) دینار.. چونکە لەبنەڕەتدا سوود بەهەموو جۆرێ شتێکی حەرامکراوە: وەك لەجێگایەکی تردا ئەفەرموێ: (.. وحرم الربا..)

﴿[131] واتقواالله لعلكم تفلحون﴾ دەسا لەخوا بترسن و لەنافەرمانی خۆتان پارێزن ، بەشکو بەختیار بن وببیەنەوە ﴿
واتقوا النار التی اعدت للكافرین﴾ و لەوئاگرەی بۆ بێ باوەڕان ئامادەکراوە خۆ پارێزن ﴿[132] واطیعوا الله والرسول
لعلكم ترحمون﴾ لەخواو لەپەیامبەر گوێرایەڵی بکەن، بەتایبەتی لەسوود خۆتان پارێزن، بەڵکو بەررەحمەتی خوا
بکەون. سوود خۆری بانقەکانی ئەمڕۆیش، لەسوود خۆری جاهیلیەتی ئەوکاتە دژوارترو خراپترە: چونکە ئەورۆژە
کەسێك شتێکی ئەفرۆشت بەشتێکی دی، ئەگەر کاتی هاتباو نرخەکەی نەبووبا بیدا، ئەوا دوای دەخست و زیادی
دەکردبۆی ، بەڵام ئێستا هەر یەکەمجار دراوێ دەدرێ بەدراوێ تا ماوەیەك، لەگەڵ ڕەچاوکردنی زیادەیەکەیش ،
پاشانیش دەسبەجێ لەسەری تۆمار دەکرێ.

## پەلە بکەن لەئەنجامدانی کارە خێرەکاندا :

﴿[133] وسارعوا إلى مغفرة من ربكم﴾ پەلەو چەسپانی بکەن بۆکردنی ئەوشتانە ئەبنە هۆی لێبوردنی پەروەردگارتان ﴿وجنة عرضها السموات والأرض﴾ و چوونە بەهەشتێکی فراوانی واوە کە: هەرپانتاییەکەی بەئەندازەی ئاسمانەکان و زەوییە، بەڵێ.. لە سورەتی (حەدید: ٢١)یشدا هاتووە: (سابقوا إلى مغفرة من ربكم وجنة عرضها كعرض السماء والأرض). جارێکیان نوێنەری (هیرەقل) بەنامەیەکەوە هاتەلای پەیامبەر ﷺ لەنامەکەیدا نوسرابوو: ئەی موحەممەد ﷺ ! تۆ لەنامەکەتدا بانگت کردوین بۆ بەهەشتێك دەڵێیت: هەر پانتاییەکەی بەئەندازەی پانتایی ئاسمان و زەوییە، جائەرئەمە وابێ، ئەی دۆزەخ لەکوێیە؟ پەیامبەر ﷺ فەرمووی: ((فَأيْنَ الليلُ إذا جاء النهارُ؟)) واتە: کە ڕۆژهات، شەو دەبێ لەکوێ بێو چی لێبێت ؟ پێشەوا ئەحمەد . ﴿اعدت للمتقین﴾ ئامادە کراوە (ئەو بەهەشتە) بۆ پارێزکاران. زانایان دەڵێن: ئەم ئایەتە بەڵگەیە بۆئەوە کە ئێستا بەهەشت ئامادە کراوەو هەیە.

الجزء الرابع　　سورة آل عمران

۞ وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا
ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ ﴿١٣٣﴾ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ
فِى ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَٱلْكَٰظِمِينَ ٱلْغَيْظَ وَٱلْعَافِينَ
عَنِ ٱلنَّاسِ ۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٣٤﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَا
فَعَلُواْ فَٰحِشَةً أَوْ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ ذَكَرُواْ ٱللَّهَ فَٱسْتَغْفَرُواْ
لِذُنُوبِهِمْ وَمَن يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّواْ عَلَىٰ
مَا فَعَلُواْ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٣٥﴾ أُوْلَٰٓئِكَ جَزَآؤُهُم مَّغْفِرَةٌ
مِّن رَّبِّهِمْ وَجَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ
فِيهَا ۚ وَنِعْمَ أَجْرُ ٱلْعَٰمِلِينَ ﴿١٣٦﴾ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِكُمْ سُنَنٌ
فَسِيرُواْ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ
﴿١٣٧﴾ هَٰذَا بَيَانٌ لِّلنَّاسِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ ﴿١٣٨﴾
وَلَا تَهِنُواْ وَلَا تَحْزَنُواْ وَأَنتُمُ ٱلْأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ
﴿١٣٩﴾ إِن يَمْسَسْكُمْ قَرْحٌ فَقَدْ مَسَّ ٱلْقَوْمَ قَرْحٌ مِّثْلُهُۥ ۚ
وَتِلْكَ ٱلْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ ٱلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ
ءَامَنُواْ وَيَتَّخِذَ مِنكُمْ شُهَدَآءَ ۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٤٠﴾

٦٧

## هێندێ لە پەسنی بەهەشتیەکان :

ئینجا خوا هەندێ سیفاتی بەهەشتییە پاریزکارەکان باسدەکاو دەفەرموێ: ﴿[134] الذین ینفقون فی السرآء
والضرآء﴾ پارێزکارە بەهەشتییکان ئەوکەسانەن کە لەخۆشی وناخۆشیدا، لە بوون ونەبووندا, ئەوان دارایی
ئەبەخشن ﴿والكاظمین الغیظ﴾ و ڕك و غەزەبی خۆیان -لەکاتی تووڕەبوندا- دەخۆنەوەو کاری پێناکەن ﴿والعافین
عن الناس﴾ و لەهەڵەی مەردم خۆش دەبن و تۆڵەناسێنن ﴿والله یحب المحسنین﴾ وخوایش خێرخوازانی خۆش
ئەوێ﴿[135] والذین إذا فعلوا فاحشة﴾ و هەرکە کارێکی دزێوو ناشیرین بکەن, واتە: گوناهێکی گەورە ئەنجام بدەن
﴿او ظلموا انفسهم﴾ یان ستەم لەخۆ بکەن , واتە: گوناهێکی بچووك بکەن ﴿ذكروا الله فاستغفروا لذنوبهم﴾ بە
تالووکەو بەپەلە، خوا یاد دەکەنەوەو، داوای لێبوردنی گوناهەکانیانی لێدەکەن ﴿ومن یغفر الذنوب إلا الله﴾ جادەبێ

-بێجگە لەخوا- کێ گوناهان بپۆشێ؟ ﴿ولم يصروا على ما فعلوا وهم يعلمون﴾ جا ئەوانە لەسەر تاوان وگوناحێ زانیویانە هەڵەیە ، سووور بەردەوام نین، خۆشیان ئەزانن کە سوور بوون لەسەر گوناح کارێکی زۆر خراپ و ناپەسەندەو، دەشزانن هەرکەسێك تەوبە بکات، خوا لێی وەردەگرێت. پەیامبەر ﷺ ئەفەرموێ: ((ما أصرَّ مَن استغفَرَ وإنْ عادَ فی الیوم سبعین مرة)) ئەبوو یەعلاو ئەبوداود. ﴿١٣٦ أولئك جزاؤهم مغفرة من ربهم﴾ ئەوانە پاداشتیان لای پەروەردگاریان بەخشین ولێبوردنە ﴿وجنات تجری من تحتها الانهار﴾ و چەند باخێکی بەهەشتە، کەچەندین جۆگەو رووبار بەبەریاندا تێدەپەرێ ﴿خالدین فیها﴾ و بەهەتا هەتاییش تێیدا ئەمێننەوە ﴿نعم أجر العاملین﴾ ئەها! چەن چاکە پاداش و کرێی ئاکارچاکان.

**حیکمەتی ڕووداوەکەی ئوحود:**

﴿١٣٧ قد خلت من قبلكم سنن﴾ بەڕاستیی پێش ئێوەیش ڕوویدا چەند ڕێ و یاسایەك، وەك ئەوە لەئێوە ڕوویدا -ئەی هاوەڵان- لەئوحوددا ! بەڵام دەرەنجام خوا سەریخستن بەسەرکافرەکاندا، دەسا مژدەبێت ئێوەیش سەردەکەون ﴿فسیروا فی الأرض فانظروا کیف کان عاقبة المکذبین﴾ جا بچن بەسەرزەوییدا و بنۆڕن پاشەڕۆژی بەدرۆخەرەوان و بێ باوەڕان چۆن بوو؟ ﴿١٣٨ هذابیان للناس﴾ ئەم قورئانە وتارو ڕوونکردنەوەیەکی گەورەیە بۆگشت مەردم ، هەمووشتێ ڕووندەکاتەوەو، حاڵی گەلانی رابووردووش بەیان دەکات، چاك وایە پێی ژیربن ﴿وهدی وموعظة للمتقین﴾ ڕێنمایی و ئامۆژگارییشە بۆ خۆپارێزان ، چونکە بەپلەی یەکەم ئەوانن پێی بەهرەمەند دەبن و گوێرایەڵ دەبن. ئینجا خوا لەبەرامبەر ڕووداوەکەی (ئوحود)ـەوە دڵ نەواییان دەکاو دەفەرموێ: ﴿١٣٩ ولا تهنوا ولا تحزنوا﴾ لەجیهاد سست و کزو بێ هێز مەبن و، خەفەت مەخۆن ﴿وانتم الأعلون﴾ چونکە هەرئێوەن بەرزو زاڵ ، دەرەنجامیش سەردەکەون ﴿إن کنتم مؤمنین﴾ ئەگەر باوەڕتان ببێ. بەڵێ.. بێگومان بیروباوەڕی موسڵمانان بەرزترە، پەیڕەوو پرۆگرمیان شیاوترە ﴿١٤٠ إن یمسسکم قرح فقد مس القوم قرح مثله﴾ خۆئەگەر ئێوە برینداریتان تووشبوو لەئوحود، بێگومان ئەوخەڵکە دوژمنەشتان (واتە: هاوبەشدانەرەکان) وەك ئێوە بریندار بوون و، تووشی هەمان زام هاتن لەجەنگی بەدردا، هەر لەم سوورەتی (ئالی عیمران: ١٤٣) دا هاتووە: (ولقد کنتم تمنون الموت من قبل أن تلقوه فقد رأیتموه وأنتم تنظرون) دیسانەوە لەهەمان سوورەت، ئایەتی (١٤٠)دا ئەفەرموێ: (ویتخذ منکم شهداء)، وەئایەتی (١٥٢)ی ئەم سوورەتە ئەفەرموی: (حتی إذا فشلتم وتنازعتم فی الأمر وعصیتم من بعد ما أراکم ما تحبون منکم من یرید الدنیا ومنکم من یرید الآخرة ثم صرفکم عنهم لیبتلیکم) وە لەئایەتی (١٥٣)یشدا ئەفەرموێ: (إذ تصعدون ولا تلوون علی أحد والرسول یدعوکم فی اخراکم) مەبەستیش لەزەخم و برینی موسڵمانەکان ئەوەبوو کەئەم چەند ئایەتەو وێنەیان دەستنیشانیان کرد برینی هاوبەشدانەرەکانیش (سوورەتی ئەنفال: ١٣،١٢) ئاماژەی بۆئەکات دەفەرموێ: (إذ یوحی ربك إلی الملائکة إنی معکم فثبتوا الذین آمنوا سألقی فی قلوب الذین کفروا الرعب فاضربوا فوق الأعناق واضربوا منهم کل بنان * ذلك بأنهم شاقوا الله ورسوله ومن یشاقق الله ورسوله فإن الله شدید العقاب) دەشگونجێ کە زام و نارەحەتی هەردوولا هەر لەڕۆژی (ئوحود)دا بووبێ. ﴿وتلك الأیام نداولها بین الناس﴾ ئێمە ئەم ڕۆژگارەی سەرکەوتن و، تێکشکانە، لەنێو مەردمدا دەستاودەستی پێدەکەین، ڕۆژێ بۆئێوەیەو، ڕۆژێکیش بۆئەوان ﴿ولیعلم الله الذین آمنوا﴾ بۆئەوە لەدنیادا خوا ئەوکەسانە دەربخاو بەخەڵکیان بناسێنێ باوەڕیان هێناوە، هەمووکەسێك بزانێ ئەوانە لەکاتی تەنگانەدا چەن بەئارامن. بەڵێ .. باوەڕداران ناسران و لەتاقیکردنەوەدا دەرچوون و، درێژەیان بەکاری خۆیانداو، هەرگیزیش بیریان لەگەڕانەوەو خۆدزینەوە نەکرد لەئوحود، (عەبدوڵڵای

کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول)ی ناپاك ودووڕا نەبیٚ، کەبەخۆیی و (٣٠٠) کەسەوە پاشەکشەی کرد بۆمەدینە، هەرئەوکارەی ئەویش بوو، (بەنی حاریسە) و (بەنی سەلەمە)ی تووشی دوودڵی کردو خەریك بوو تێك بشکێن وبگەڕێنەوە، جالەم جەنگەدا موسڵمانەکان (٧٠) شەهیدیان دا، چواریان بارکەران بوون و، لەنێوانیاندا (حەمزە)ی مامی پەیامبەر و ﷺ (موسعەب) بەدی دەکران، ئەوانی تر گشت لەئەنسار بوون (خوا لەهەموان رازیی بێت) بێگومان بەوجیهادو چوونە گۆڕەپانەی جیهادەوە پاك و ناپاك لێك جیاکرایەوە، باوەڕدارو بێ باوەڕ دەردەکەوت و ﴿ویتخذ منکم شهداء﴾ وە چەند شەهیدێکیشتان لێوەرگریٚ، واتە: لەرێی خوادا بکوژرێن وڕێزتان لیٚ بنیٚ بەشەهیدیی و، بۆدوایيیش پتر دیفاع وبەرەوانی لەدینەکەی خوا بکەن ﴿والله لایحب الظالمین﴾ وخوا خەڵکانی ستەمکاری خۆش ناویٚ ﴿[١٤١] ولیمحص الله الذین آمنوا ویمحق الکافرین﴾ و تا ئەوموسڵمانە راستانە لەبێژنگ بداو، کافرەکانیش لەناوبباو بفەوتێن، واتە: موسڵمانی سەنگەر، لەموسڵمانی خەوت وخەوالّو دەرکەوێت. جا لەبەرئەمانە گشت، خوا دەستوورو بڕیاری جەنگیدا لەگەڵ موشریکان.

**بیٚ ئەزموون چۆن دەچنە بەهەشت؟:**

﴿[١٤٢] ام حسبتم ان تدخلوا الجنة﴾ ئاخۆ ئێوە پێتان وایە، هەروا بیٚ تاقیکردنەوە بەکوشتارو جیهاد، بەئاسانی بچنە بەهەشتەوە؟ ﴿ولما یعلم الله الذین جاهدوا منکم ویعلم الصابرین﴾ کەهێشتا جیهادکەران و خۆراگرانتان - لەگۆڕەپانی جەنگدا- لای خوا دەرنەکەوتوون و تاقی نەبوونەتەوە. واتە: خوا حەزدەکا ببینیٚ ئەوانەی جیهاد دەکەن و ئەوانەی ئارام دەگرن، وەلەم ئایەتەشدا خوا موسڵمانەکان هەڵدەنیٚ لەسەر جیهادو لەسەر صەبر، چونکە بەهەشت بێتاقیکردنەوە بۆهیچ کەسێك دەست نادا، هەروەك لەم چەن ئایەتەیشدا ڕوونکراوەتەوەو دەفەرمویٚ: (ام حسبتم ان تدخلوا الجنة ولما یأتکم مثل الذین خلوا من قبلکم مستهم البأساء والضراء وزلزلوا حتي یقول الرسول والذین آمنوا معه متی نصر الله الا إن نصرالله قریب) (بەقەرە: ٢١٤)، و یان لەسوورەتی (تەوبە: ١٦)دا هاتووە: (ام حسبتم ان تترکوا ولما یعلم الله الذین جاهدوا منکم ولم یتخذوا من دون الله ولا رسوله ولا المؤمنین ولیجة والله خیر بما تعلمون) یان دەفەرمویٚ :(الم * احسب الناس ان یترکوا ان یقولوا آمنا وهم لا یفتنون * ولقد فتنا الذین من قبلهم فلیعلمن الله الذین صدقوا ولیعلمن الکاذبین) (عەنکبووت: ١،٣). بەڵیٚ.. ئەوانەی واکاتی خۆی ئامادەی جەنگی (بەدر) نەبوبوون، ئاواتیان دەخواست جەنگێکیان بۆ سازببیٚ، هەتا لەپێناو دینی خوا بجەنگێن و، بە پلەی شەهیدی بگەن، وە یان کافران بشکێنن، کەچی ئەوحەلە جەنگەکە فەرزکراو دەبوو بێنە گۆڕەپانی جیهادەوەو بەئارامبن، وا دەرنەچوون! ئەوجا خوا فەرمووی: ﴿[١٤٣] ولقد کنتم تمنون الموت من قبل أن تلقوه﴾ سوێند بەخوا ئێوە بەر لەوە ئەمڕۆ لەگەڵ مەرگدا ڕووبەڕوو ببنەوە، ئاواتی

الجزء الرابع — سورة آل عمران

وَلِيُمَحِّصَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَيَمْحَقَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٤١﴾ أَمْ
حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُواْ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَعْلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ
مِنكُمْ وَيَعْلَمَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٤٢﴾ وَلَقَدْ كُنتُمْ تَمَنَّوْنَ ٱلْمَوْتَ مِن
قَبْلِ أَن تَلْقَوْهُ فَقَدْ رَأَيْتُمُوهُ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ ﴿١٤٣﴾ وَمَا مُحَمَّدٌ
إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ
ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ
ٱللَّهَ شَيْـًٔا وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾ وَمَا كَانَ
لِنَفْسٍ أَن تَمُوتَ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ كِتَٰبًا مُّؤَجَّلًا وَمَن يُرِدْ
ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا نُؤْتِهِۦ مِنْهَا وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ ٱلْءَاخِرَةِ نُؤْتِهِۦ
مِنْهَا وَسَنَجْزِى ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٤٥﴾ وَكَأَيِّن مِّن نَّبِىٍّ قَٰتَلَ مَعَهُۥ
رِبِّيُّونَ كَثِيرٌ فَمَا وَهَنُواْ لِمَآ أَصَابَهُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَمَا ضَعُفُواْ
وَمَا ٱسْتَكَانُواْ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٤٦﴾ وَمَا كَانَ قَوْلَهُمْ
إِلَّآ أَن قَالُواْ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَإِسْرَافَنَا فِىٓ أَمْرِنَا وَثَبِّتْ
أَقْدَامَنَا وَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٤٧﴾ فَـَٔاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ
ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا وَحُسْنَ ثَوَابِ ٱلْءَاخِرَةِ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٤٨﴾

٦٨ — يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ

مردنتان دەخواست! ﴿فقد رايتموه وانتم تنظرون﴾ سا وا بینیتان و سەیرتان دەكرد, واتە: هۆیەكانی مردنتان بینیی و سەیرتان دەكرد براكانتان دەكوژرێن و نزیك بوو ئێوەش بكوژرێن، دەسا جەنگ بكەن وتێبكۆشن. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((لاتَتَمَنَّوْا لِقاءَالعَدُوِّ، وَسَلُوا العافِيَةَ، فَإِذا لَقيتُمُوهمُ فَاصْبِرُوا، وَاعْلَموا انّ الجنّةَ تحتَ ظِلالِ السُيُوفِ)) واتە: ئاواتی رووبەروو بوونەوەی دوژمن مەخوازن، هەمیشە لەخوا بخوازن لەبەلاّتان دووركرێ، جائەر رۆژێكیش بەدوژمن گەیشتن بەئارامبن، چاكیش بزانن بەهەشت لەژێر سێبەری شیرەكاندایە.

**دەنگۆی مردنی پێغەمبەر ﷺ لە ئوحود:**

(ئیبن قومەیئە)ی موشریك لەئوحودا بەردێكی بۆپەیامبەر ﷺ هەڵداو ددانی پیرۆزی شكاندو، هاتە پێشەوە بیشیكوژێ، بەلاّم (موصعەب) پەلاماری دایەو نەیهێشت، كەچی لەپاڵ ئەوەدا موصعەبی شەهیدكردو، جاڕیشیدا كە: موحەممەدم كوشت, چونكە سەروسیماو شێوەی پێغەمبەرو موصعەب زۆر لەیەك دەچوو، وایزانی پێغەمبەری كوشتووە، جا بەو دەنگۆو پروپاگەندەیە هەندێ لەهاوەلاّن خاوبونەوەو ترسان وگۆرەپانیان بەجێهێشت و، خوایش فەرمووی: ﴿[١٤٤] و ما محمد إلا رسول قد خلت من قبله الرسل﴾ موحەممەدیش تەنها هەرپێغەمبەرێكەو چیتر نییە، بەرلەویش گەلێ پەیامبەرانی تر هاتوون و رۆیشتوون و مردوون ودینەكەشیان دوای خۆیان هەر ماوەتەوە، ئەمیش هەروەك ئەوان وایە ﴿افإن مات او قتل انقلبتم على اعقابكم﴾ باشە! ئەر ئەو وەفاتیكرد وەك (موسا)و (عیسا) وەیان كوژراو شەهیدبوو وەك (زەكەریا)و (یەحیا) ئێوە پاشگەز دەبنەوەو لەدین وەردەگەرێن؟ بەڵێ ئەورۆژە كە هاوبەشدانەرەكان بلاّویان كردەوە كە: پەیامبەر ﷺ كوژراوە، ترس وبیمێكی زۆر كەوتە دڵی هەندێ لەموسڵمانەكانەوەو لەنێو گۆرەپانەكەدا سست ولاواز بوون، ئەوسا خوایش بەو ئایەتە گلەیی لێكردن: ﴿ومن ينقلب على عقبيه﴾ خۆ هەركەسێكیش پاشگەز بێتەوەو لەدین وەرگەرێ ﴿فلن يضرالله شيئا﴾ باچاك بزانێت كە هەرگیز ناتوانێ زیانێ بەخوا بگەیەنێت ، بەڵكو هەر لەخۆی زیان دەدات ﴿وسيجزى الله الشاكرين﴾ دڵنیاشبن كەخوا پاداشتی شوكرانە بژێران ئەداتەوەو سەریان دەخات.

تێبینی: پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ رۆژی دووشەممە هیجرەتی كرد بۆمەدینەو كاتی چێشتەنگاو گەیشتە ئەوێ، هەر رۆژی دووشەممەش بوو، كۆچی یەكجاری كردو، بۆ هەتاهەتاییش گەرایەوە لای خوای میهرەبان ودلۆڤان، رۆژی سێ شەممەو، شەوی چوار شەممەبوو بەخاك ئەسپاردرا. (ئەنەس) ئەڵێ: ئەورۆژە كەهیجرەتی كردو گەییە (مەدینە) شارو دەوروبەری شار پرشنگداربووو گەشایەوە، ئەورۆژەش كۆچی دوایی كرد، تاریكایی و خەم وخەفەت بەجارێ دنیای مەدینەی داپۆشی، تەنانەتی لێمان تێكچوو بوو و خۆمانمان نەدەناسیەوە، هەربۆیە (عومەری كوری خەتاب) وتی: (إنّ الرسولَ لَمْ يَمُتْ، ولنْ يَمُوتَ) بێگومانم كە پێغەمبەر ﷺ نەمردووەو، ناشمرێ! هەتا (ئەبوبەكر) هێوری كردەوەو چوویە سەر میمبەرو وتی: (من كان يعبد محمدا فإن محمدا قد مات، ومن كان يعبد الله فإن الله حى لايموت)، واتە: خەڵكینە! هەركەسێك موحەممەدی پەرستبێ، ئەوا موحەممەد مرد، هەركەسیش خوای پەرستبێت، ئەوا خوا زیندووەو هەرگیز نامرێت. پاشان ئایەتی (وما محمد إلا رسول قدخلت من قبله الرسل..)ی بۆ خوێندنەوەو خەڵكەكە هێور بوویەوە.

**بەبڕیاری خوا نەبێ هیچ كەسێك نامرێ:**

﴿[١٤٥] وما كان لنفس ان تموت إلا بإذن الله﴾ هیچ كەسێك چ پەیامبەرو خەڵكی تر بەویست و فەرمانی خوا نەبێ نامرێ، واتە: مردن پێش وپاش ناكاو، لای خوا ماوەی بۆدیاریكراوەو، نەبەچوونە جیهادەوە -بەر لەكات وساتی

خۆی- زوودێت، وه نه بەپاڵدانەوەو خۆ لەجیهاد دزینەوە دوا دەکەوێت ﴿کتابا مؤجلا﴾ مردنی هەرکەسێك، کاتی نووسراوەو تۆمار کراوه، ئیتر خۆشاردنەوەی بۆچیە لەگۆڕەپانی جیهاد، خوا دەفەرموێ: (وما یعمر من معمر ولا ینقص من عمره إلا فی کتاب..) ﴿ومن یرد ثواب الدنیا نؤته منها﴾ هەرکەسێك لەهەوڵەکانیدا تەنیا پاداشتی ئەم دنیایە حەز لێبکا، واتە: تەنیا دەستکەوتی جەنگیی پێش چاو بگرێ ئێمەش بەشی لێدەدین، واتە: ئەویش بەدەستی خوایە بیدا، یانەیدا ﴿ومن یرد ثواب الآخرة نؤته منها﴾ هەرکەسێکیش خۆشی و نیعمەتی دوارۆژی گەرەك بێ، خوا هەر پێیدەدا، واتە: کەسێ هەربۆ دنیا بکۆشێت، خوا مەیلی لەچەند بێت دەیداتێ، بەڵام لەقیامەتدا بێبەش دەبێ، هەرکەسیش بۆقیامەت هەوڵبدات، ئەوا قیامەت مسۆگەرەو، لەدنیاشدا -ئەرمەیلی هەبێ- بەشی دەدات ، کەوابوو دنیاو قیامەت هەرلای خوایە ﴿وسنجزی الشاکرین﴾ بێگومان لەدنیاو لەقیامەتدا پاداشتی سوپاسگوزاران دەدەینەوە، ئەوانەی کەخۆیان راگرت لەگۆڕەپانی جەنگدا لەهەردوولا سەربەرزن.

**بۆ دڵدانەوەی ئیماندارەکانی ئوحود:**

﴿[١٤٦] و کأین من نبی قاتل معه ربیون کثیر﴾ پەیامبەرانێکی زۆر لەرێی خوادا جەنگان و، لەگەڵ ئەوانیشدا کۆمەڵێکی زۆری زانای خواپەرست وصالح، شان بەشانیان لەبەربەرزکردنەوەی وشەی خوا، جەنگان وتوشی ئێش وئازارێکی زۆربوون و هەندێکیشیان کوژران (وەکو ئێوە) ﴿فما وهنوا لما أصابهم فی سبیل الله﴾ کەچی ئەوانەشیان ، وامان و نەکوژران، لەبەرئەو نارەحەتییە لەرێی خوادا دووچاریان بوو، هیچ وەخت لاوازو خاوو بێ هێز نەبوون ﴿وما ضعفوا﴾ و بێ تین و سستیش نەبوون لەجیهاد ﴿وماستکانوا﴾ وسەریشیان بۆ دوژمن دانەخست و، پشتیان لەجیهاد هەڵنەکرد دەسا ئێوەیش ئەی یارانی ئوحود! هەرگیز ماندو نەبن ونەپسێن وبەئارامبن ﴿والله یحب الصابرین﴾ خواش خەڵکانی خۆگرو بەئارامی خۆش دەوێ، ئەوانەی کە هێزی دەروونیان ناپسێت و، تەسلیم بەدوژمن نابن و خۆ بەدەستەوە نادەن ﴿[١٤٧] وماکان قولهم إلا أن قالوا ربنا اغفر لنا ذنوبنا﴾ پاش ئەوهەموو بەڵاو نەهامەتانەشیان هەردەیانگوت: پەروەردگارەکەمان! لەگوناحمان خۆشببە ﴿وإسرافنا فی أمرنا﴾ و لەدرێغیی و زیادەڕەویمان بپۆشە ﴿وثبت أقدامنا﴾ وپتەوتر پێمان داچەقێنە لەگۆڕەپانی جەنگدا، تاهەرگیز نەپسێین وهەڵنەیەین ﴿وانصرنا علی القوم الکافرین﴾ سەرمان بخە بەسەر هۆزی کافراندا. بەڵێ.. پاش ئەوجیهادە درێژوو بێ وچانە داوای دەوڵەمەندیی و پاداشتی دنیا ناکەن و، لەگەڵ خوای خۆیاندا زۆر بە وێڵ و بەئەدەبەوە دێنە ئاخافتن، بۆیە داوای هیچ شتێکی دنیایان لێنەکرد بۆخۆیان، جا لەبەرامبەر ئەوەشەوە خوا هەمووشتێکی پێدان، لەهەمان کاتدا ئەم ئایەتی (وکأین من نبی) سەرزەنشتیشە بۆ هەڵهاتووەکانی رۆژی ئوحود، واتە: هەق نەبوو ئێوەش هەڵێن و پێغەمبەر ﷺ لەگۆڕەپاندا بەجێ بێڵن ﴿[١٤٨] فآتاهم الله ثواب الدنیا وحسن ثواب الآخرة﴾ ئینجا لەبەرئەوە خوایش پاداشتی دنیاو ئاخرەتی پێدان لەدنیا سەری خستن و چاکەو پاداشی دوا رۆژیشی پێدان، واتە: لێبوردن و بەهەشتی خۆی دانێ ﴿والله یحب المحسنین﴾ بەردەوام خوا ئاکار چاکانی خۆش دەوێ ، بەراستی ئەوان جیهادی چاکیان کرد بۆخوا.

**شوێنی فات و فیتی خوانەناسان مەکەون:**

هەرکە دووڕازەکان لەئوحود گەڕانەوە خێرا کردیانە فات وفیت لەموسڵمانەکان وگوتیان: ئەگەر راستبووبا موحەممەد ﷺ پەیامبەرە، ئێوە ئەوەتان دووچار نەدەبوو !ئەوجا خوای گەورە بۆئەوە بڕوادارەکان هۆشیار بکاتەوەو، هیچ کات گوێڕایەڵ و بەرفەرمانی دوژمن نەبن، فەرمووێ: ﴿[١٤٩] یاأیهاالذین آمنو إن تطیعوا الذین کفروا﴾

ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! ئەگەر ئێوە گوێڕایەڵی کافرو بێ باوەڕان بکەن ﴿یردوکم علی أعقابکم﴾ ئەوا لەدین
پاشگەزتان دەکەنەوە، چونکە ئەو تێکشکانە دەکەنە داوو ئێوەی پێ تووشی دوودڵی دەکەن ﴿فتنقلبوا خاسرین﴾
ئەوحەلە بەزیانمەندی دەگەڕێنەوە ﴿[١٥٠] بل الله مولاکم﴾ گوێ بۆئەوانە مەگرن، دۆست ویارمەتیدەرو سەروەری
ئێوە، تەنیاو تەنیا خوای گەورەیە، هەر ئەویارمەتی ئێوە دەدا، جاکەوابوو هەرگوێڕایەڵی ئەوبن و، مەکەونە شوێن
پروپاگەندەی ئەوانە ﴿وهو خیر الناصرین﴾ هەر ئەو(خوا)یشە لەهەمووکەس چاکتر یارمەتیدەرو کۆمەککارە ﴿[١٥١]
سنلقی فی قلوب الذین کفروا الرعب﴾ بێگومان ترس ولەرز دەخەینە دڵی بێ باوەڕانەوەو ئەوسا دەشکێن، بەڵێ
ئەمە یاسای خوایە کە هەرکات کافران دەگەنە موسڵمانی راستەقینە، ترسی بڕوادارەکان دەچێتە دڵیانەوەو،
لەگۆڕەپاندا هەڵدێن ورادەکەن، هەر ئەمەیە کەپێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: ((أُعْطِيتُ خَمْسا لَمْ يُعْطَ أَحَدٌ مِنَ الأنْبِياءِ قَبْلِي: نُصِرْتُ بالرُّعْبِ مَسِيرَةَ شَهْرٍ..)) فتح الباری. ﴿بما اشرکوا بالله ما لم ینزل به سلطانا﴾ لەبەرئەوە کە بێ بەڵگەی خوایی، هاوبەشیان بۆخوا دانا! دیارە ئەوکارە کارێکی زۆر ناڕەواو ناهەقەو، لەبەردەم هەقدا قەت ئۆقرە ناگرێ ﴿ومأواهم النار﴾ و جێگاو ئارامگەیان ناو ئاگری دۆزەخە ﴿وبئس مثوی الظالمین﴾ و جێ و رێی ستەمکارانیش خراپترین جێگا دەبێ لەدۆزەخدا.

**کە ڕووتان لە تالأنەکە نا، کێشە پەیدا بوو و شکان:**

﴿[١٥٢] ولقد صدقکم الله وعده﴾ بێگومان، خوا بەڵێنی بەئێوەداو جێبەجێشیکرد، ئەوەبوو تاقی بەیانیەکەی، ئێوە زۆر بە دڵسۆزانە هاتنە گۆڕەپانەوەو جەنگتان دەکرد، خوایش یارمەتیدان و لەوسەرەتایەوە سەریخستن، وەکو دەفەرموێ: ﴿إذ تحسونهم بإذنه﴾ ئەوحەلە کە بەفەرمانی خوا دوژمنتان دەکوشت و قەلاچۆتان دەکردن، هەتا ئەوەندە بەجوان دەجەنگان پەیامبەریش ﷺ فەرمووی: ((لکم النصر

الجزء الرابع سورة آل عمران

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تُطِيعُواْ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ
يَرُدُّوكُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ فَتَنقَلِبُواْ خَٰسِرِينَ ﴿١٤٩﴾
بَلِ ٱللَّهُ مَوْلَىٰكُمْ وَهُوَ خَيْرُ ٱلنَّٰصِرِينَ ﴿١٥٠﴾ سَنُلْقِى
فِى قُلُوبِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلرُّعْبَ بِمَآ أَشْرَكُواْ بِٱللَّهِ
مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَٰنًا وَمَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ وَبِئْسَ
مَثْوَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٥١﴾ وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ ٱللَّهُ
وَعْدَهُۥٓ إِذْ تَحُسُّونَهُم بِإِذْنِهِۦ حَتَّىٰٓ إِذَا فَشِلْتُمْ
وَتَنَٰزَعْتُمْ فِى ٱلْأَمْرِ وَعَصَيْتُم مِّنۢ بَعْدِ مَآ أَرَىٰكُم
مَّا تُحِبُّونَ مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنْيَا وَمِنكُم
مَّن يُرِيدُ ٱلْءَاخِرَةَ ثُمَّ صَرَفَكُمْ عَنْهُمْ لِيَبْتَلِيَكُمْ
وَلَقَدْ عَفَا عَنكُمْ وَٱللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ
﴿١٥٢﴾ ۞ إِذْ تُصْعِدُونَ وَلَا تَلْوُۥنَ عَلَىٰٓ أَحَدٍ
وَٱلرَّسُولُ يَدْعُوكُمْ فِىٓ أُخْرَىٰكُمْ فَأَثَٰبَكُمْ
غَمًّۢا بِغَمٍّ لِّكَيْلَا تَحْزَنُواْ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ
وَلَا مَآ أَصَٰبَكُمْ وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٥٣﴾

٦٩

ما صبرتم)) واتە: هەتا بەئارامبن، سەرکەوتوو دەبن، بەڵێ وابوو هەرلە سەرکەوتندا بوون ﴿حتی إذا فشلتم وتنازعتم فی الأمر﴾ هەتا ئەوکاتەی ترسان وسست و لاواز بوون و، بووبە کێشەتان لەسەرهەندێ دەسکەوت ﴿وعصیتم من بعد ما أراکم ماتحبون﴾ ئیتر پاش دیتنی سەرکەوتن وتالأنەکە، کەبەتەمای بوون، لاتانداو سەرپێچی فەرمانەکانی پەیامبەرتان کردو، بۆسەو کەمینی سەر شاخەکەتان چۆڵکردو، سەرئەنجام هەموو تێکشکان ﴿منکم من یرید الدنیا﴾ بووتان ماڵی دنیای دەویست ، غەنیمەت و دەستکەوتی مەبەست بوو، بەتایبەتی کە لەسەرەتاوە کافرەکان شکان و چاوتان بڕییە کەل وپەلەکەیان ﴿ومنکم من یرید الآخرة﴾ هەیشتان بوو پاداش وخۆشی دواڕۆژی دەویست، گوێی بەدەستکەوتەکە نەدەداو کێوەکەی جێنەهێشت ﴿ثم صرفکم عنهم لیبتلیکم﴾ لەپاشان خوا دەستی ئێوەی لەو جەنگە کۆتاکردو یارمەتی خۆی لێگرتنەوەو تێشکانو، بێباوەڕانیش زاڵبوون، خوا ئەوەی کرد هەتا

تاقیتان بکاتەوەو دەرکەوێ چەن بەئارامن لەکاتی تێشکان، بەڵێ.. ئەوانە لەگەڵ ئەوەیشدا ئالآی خوایان بەرزکردبوویەوەو، موسڵمانیش بوون، بێ تاقیکردنەوە خوای گەورە سەری نەخستن، دەبێ خۆشەویستی دنیا لایان نەمێنێ و هەوڵەکانیان هەر لەبەردینی خوا بێ و، خۆیان لە هەمووشتێ داماڵن ئەگینا سەرناکەون ﴿ولقد عفا عنكم﴾ لەگەڵ ئەوەیشدا خوای دلۆڤان ئێوەی لەو هەڵە بەخشی و لێتان خۆشبوو، چونکە ئەوان زۆرو ئێوە کەم و، بەدەس ئەنقەسیش نەبوو ﴿والله ذوفضل على المؤمنين﴾ خوا خاوەنی فەزڵ و رێزە بۆباوەڕداران، بۆیە لێیان خۆشبوو، بەڵێ بڕواداران تا بەچاکی ڕووبکەنە خواو بەرنامەکەی خوا، ئەوا خوایش باشتر یارمەتیان دەدات، هەرچەندە هەندێ جار تووشی هەڵەیش بن، موسڵمانانی ئەودەمە تەنیا هەڵەیەك بوو کردیان، ئاوا یارمەتییان لێگیرایەوەو شکستیان هێنا، جادەبێ موسڵمانانی ئەمڕۆ شیاوی چی بن؟ بێ شك هەر ئەم هۆیەیە، ئێستا بوونەتە ژێردەستەی جیهانیان، هیچ کیان و بوونێکیان نیە.

### شێوازی هەندێ لەتێشکانەکەی ئوحود:

﴿[١٥٣] إذ تصعدون ولا تلوون على احد﴾ ئەوحەلە کە هەڵاتن و بڵاوەتان کردو، وە بەکێوەکەدا سەردەکەوتن و لەترس دوژمندا لاتان بەلای هیچ کەسێکدا نەدەکردەوە ﴿والرسول يدعوكم فى اخراكم﴾ پەیامبەریش ﷺ لەپشت سەرتانەوە هەربانگی دەکردن و، ئەی فەرموو: ((إلَيّ عِبَادَالله، إليّ عِبَادَالله، أنا رسولُ الله مَنْ يَكِرُّ فَلَهُ الجنةُ))، واتە: ئەوحەلە کە شکان وپەرتبوون، دەستەیەك بەرەو مەدینە گەرانەوەو، دەستەیەکیش چوونە سەر تاشە بەردەکانی (ئوحود) پێغەمبەریش ﷺ هەر ئەیفەرموو: بگەڕێنەوەو وەرنە لای من، بگەڕێنەوەو وەرنە لای من. ئەی بەندەکانی خوا! هەرکەسێك بگەڕێتەوە بەهەشتی بۆهەیە، کەچی ئێوە هەر ملتان ناو ئاوڕتان نەدایەوە! ﴿فأثابكم غما بغم﴾ ئینجا لەبەرئەوە کەئێوە خەم وخەفەتتان خستە دڵی پێغەمبەرەوە، خوایش هەر بەخەم وخەفەت جەزای دانەوە، لەبەرامبەر ئەوکارەتانەوە دوومەراقی گەورەی پێچەشتن: یەکەم: خەمی تێکشکان. دووەم: خەمی ئەوە کە وتیان: پەیامبەر ﷺ کوژرا! ﴿لكيلا تحزنوا على ما فاتكم ولا ما اصابكم﴾ تا بۆ ئەودەستکەوتەی لەدەستتان چوو و، بۆ ئەوکوشتن و برینانەشتان دووچارتان بوون لەوێ دڵگران نەبن ﴿والله خبير بما تعملون﴾ بێگومان بن کەخوا بەوکارانە دەیکەن، زاناو بەئاگایەو پاداشیشتان ئەداتەوە.

### ڕێنماییەکانی ئایەتی (١٥٢-١٥٣):

١- فەرمان شکاندنی فەرماندە بەتایبەتی لەکاتی جەنگدا دەبێتە هۆی تێکشکان.

٢- نافەرمانی لەخواو لەپێغەمبەر ﷺ وئیختلاف و کێشە لەنێو ئوممەتدا، ئاسەوارێکی رەشی دەبێ، لای کەمی تێکشکانی دنیایەو، لەدەستدانی دەوڵەت وحکومەتە.

٣- هەر موسیبەتێ تووشی مرۆڤ ببێ لای خوا لەوە گەورەتریش هەیە، تێشکانی (ئوحود) ئەگەرچی بەڕەواڵەت تۆڵەو سزابوو، بەڵام لەواقیعدا نیعمەت و تاقیکردنەوە بوو، چونکە موسڵمانەکان وشیاربوونەوە کەسەرکەوتن و تێشکان هەردوو بەسراون بەکۆمەڵێ هۆکارەوە لەسەرویانەوە بەرفەرمانی و تاعەتی فەرماندە، دەبێ ئەوهۆکارانە پشتگوێ نەخرێن، تەنها جارێ نافەرمانی کردنی پێغەمبەر ﷺ دەبێتە مایەی چەندین شەهیدو بریندارو تێکشکان، خۆ حاڵەتی ئێستای موسڵمانانیش باشترین بەڵگەی ئەو راستییەیە، چونکە ئەو هاوەڵان یەکجار سەرپێچییان کردبێت، خۆئێستا سەدان وهەزاران سەرپێچی ولاساری هەیە!

## پاش ئەو خەمە، خوا بۆ ئۆقرەی دڵ، خەواندنی:

﴿[١٥٤] ثم انزل عليكم من بعد الغم امنة نعاسا﴾ جاخوای میهرەبان پاش ئەوخەم وخەفەتە قورسە، هێمنیی و ئاسوودەییەکی باشی بۆناردن، سووکە خەوێکی لێخستن، هەتا بحەوێنەوەو وزەشتان دەمە زەرد بێتەوەو ئەو ناڕەحەتیەتان لەبیربچێتەوە ﴿يغشى طائفة منكم﴾ خەوەنووچکەکە، هەندێکتانی گرتەوەو لەوخەم وخەفەتە حەوانەوە. پێشەوا (بوخاریی) دەڵێ (ئەبو تەلحە) وتی: من یەکێك بووم لەوانە خەوەنووچکە بردیمیەوەو، چەند جارێك شمشێرەکەم لەدەست بەربوویەوەو هەڵمگرتەوە. دیاریشە کەخەو لەکاتی وادا بەڵگەی پشتگیری خوایە. ﴿وطائفة قد اهمتهم انفسهم﴾ دەستەیەکیش (لە دووڕازەکان) هەرخۆیانیان لا مەبەست بوو، لەبەرئەوە لەخەوەنووچکەکە کەمایەی ئیسراحەت و حەوانەوەی دڵان بوو بێبەشبوون ﴿يظنون بالله غير الحق ظن الجاهلية﴾ گومانی ناهەقیان بەخودا دەبرد وەکو گومانی سەردەمی جاهیلیەت ﴿يقولون هل لنا من الأمر من شئ﴾ و ئەیانوت: ئایا ئێمە لەم کارە هیچمان هەیە؟ واتە: ئێمە بەزۆر هێنراوین، چونکە ئەگەر بەرای ئێمە بوایە ئەوائێمە لەمەدینە دەمااینەوەو، دەرنەدەچووین و ئەم حاڵەشمان تووش نەدەبوو ﴿قل إن الأمر كله لله﴾ پێیان بڵێ ئەی پێغەمبەر! ﷺ کەبێ شك گشت کارێ هەر بەدەستی خوایە، سەرکەوتن و سەرنەکەوتن، هیچ کەسێك بۆی نییە لەخۆیەوە فەرمان بدات، دەسا تۆش تەنها فەرمانی سەرشانی خۆت جێبەجێ بکەو گوێیان بۆمەگرە ﴿يخفون فى انفسهم مالا يبدون لك﴾ گەلێ کاری نهێنی لەدڵ ودەروونیاندا دەشارنەوەو لای تۆ دەرینا خەن ﴿يقولون لوكان لنا من الأمر شئ ما قتلنا ها هنا﴾ بۆنموونە دەڵێن: ئەگەر ئێمە شتێکمان بەدەست بوایە، هەرگیز نەدەهاتین بۆ دەرەوەی مەدینەو لێرەیش بەکوشت نەدەچووین ﴿قل لو كنتم فى بيوتكم لبرز الذين كتب عليهم القتل إلى مضاجعهم﴾ ئەی پێغەمبەر! ﷺ پێیان بڵێ: ئەگەرئێوە لەماڵی خۆشتان بووبان و نەهاتنایە گۆڕەپانی جەنگەوە، هێمان ئەوانەی وا کوشتنیان لەسەر نووسراوە، دەهاتنە جێی تەخت بوونی لاشەیان و لەوێ مەرگیشیان تووش دەبوو، واتە: لەقەدەری خوای گەورە دەرچوونیان نەدەبوو ﴿وليبتلى الله مافى صدوركم﴾ بۆیە خوا ئەوشتانەشتان بەسەردێنی، دەیەوێ دڵودەروونتان تاقی بکاتەوە، گومانیش نییە کەبەڵاو ناڕەحەتی باشترین هۆکارە بۆدەرکەوتنی دڵسۆزیی و، ئاشکرابوونی لاریی ولاساریی مرۆڤ ﴿وليمحص ما فى قلوبكم﴾ دەیشیەوێ هەرچی لەدڵتانایە لەبێژنگی بداو دەری بخا ﴿والله عليم بذات الصدور﴾ خواش لەڕازو نیازی دڵەکان زاناو ئاگادارە.

الجزء الرابع سورة آل عمران

ثُمَّ أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّنۢ بَعْدِ ٱلْغَمِّ أَمَنَةً نُّعَاسًا يَغْشَىٰ طَآئِفَةً
مِّنكُمْ ۖ وَطَآئِفَةٌ قَدْ أَهَمَّتْهُمْ أَنفُسُهُمْ يَظُنُّونَ بِٱللَّهِ غَيْرَ
ٱلْحَقِّ ظَنَّ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ۖ يَقُولُونَ هَل لَّنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ مِن شَىْءٍ ۗ
قُلْ إِنَّ ٱلْأَمْرَ كُلَّهُۥ لِلَّهِ ۗ يُخْفُونَ فِىٓ أَنفُسِهِم مَّا لَا يُبْدُونَ لَكَ ۖ
يَقُولُونَ لَوْ كَانَ لَنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ مَّا قُتِلْنَا هَٰهُنَا ۗ قُل لَّوْ كُنتُمْ
فِى بُيُوتِكُمْ لَبَرَزَ ٱلَّذِينَ كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقَتْلُ إِلَىٰ مَضَاجِعِهِمْ ۖ
وَلِيَبْتَلِىَ ٱللَّهُ مَا فِى صُدُورِكُمْ وَلِيُمَحِّصَ مَا فِى قُلُوبِكُمْ ۗ
وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ١٥٤ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَلَّوْا۟ مِنكُمْ
يَوْمَ ٱلْتَقَى ٱلْجَمْعَانِ إِنَّمَا ٱسْتَزَلَّهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ بِبَعْضِ مَا
كَسَبُوا۟ ۖ وَلَقَدْ عَفَا ٱللَّهُ عَنْهُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ ١٥٥ يَٰٓأَيُّهَا
ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَقَالُوا۟ لِإِخْوَٰنِهِمْ إِذَا
ضَرَبُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ أَوْ كَانُوا۟ غُزًّى لَّوْ كَانُوا۟ عِندَنَا مَا مَاتُوا۟ وَمَا
قُتِلُوا۟ لِيَجْعَلَ ٱللَّهُ ذَٰلِكَ حَسْرَةً فِى قُلُوبِهِمْ ۗ وَٱللَّهُ يُحْىِۦ وَيُمِيتُ ۗ
وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ١٥٦ وَلَئِن قُتِلْتُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ
أَوْ مُتُّمْ لَمَغْفِرَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَحْمَةٌ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ١٥٧

## ئەوانەتان لە ئوحود هەڵهاتن:

﴿[١٥٥] إن الذين تولوا منكم يوم التقى الجمعان﴾ بێگومان ئەوانەتان کەلەرۆژی بەرەنگاربوونەوەی هەردوو دەستەی موسڵمان و بێ باوەڕدا لەخەزای (ئوحود)دا پشتیان هەڵکردو لەگۆڕەپان هەڵاتن ﴿إنما استزلهم الشيطان ببعض ماكسبوا﴾ هەر لەبەرکارێ بوو پێشتر کردبویان، شەیتان هەڵی خلیسکاندن و تووشی ئەوهەڵەیەی کردن، پەیامبەر ﷺ بەجەنگاوەرەکانی فەرموو: لەسەر شاخەکە قەت نەجوڵێن، کەچی شەیتان فریویدان و سەر شاخەکەیان بەجێ هێشت وئەوکارە روویدا! ﴿ولقد عفاالله عنهم﴾ وە بێگومان خوا لەسزای دوارۆژ بەخشینی ﴿إن الله غفور حليم﴾ بێگومان هەرخوایە زۆرلێبوردەو، زۆریش لەسەرخۆو هێمنە، پەلە ناکاو لەمرۆڤان دەبورێت.

## ئێوە وەك خوانەناسان مەڵێن:

﴿[١٥٦] ياأيها الذين آمنوا لا تكونوا كالذين كفروا﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! ئێوە وەکو ئەو کافرانە مەبن ﴿وقالوا لإخوانهم إذا ضربوا فى الأرض أو كانوا غزى﴾ کە بەبرا کافرەکانیان دەوت: کاتێ چووبانە سەفەری بازرگانی، وە یان جەنگی دوژمن و مردبان ﴿لو كانوا عندنا ما ماتوا وما قتلوا﴾ ئەگەر لای ئێمە مابان و نەچووناية سەفەر یان جەنگ، نەدەمردن و، نەدەکوژران. موسڵمان دەبێ ملکەچی پلان و نەخشەی خوا بێت، چ بۆ تەمەن و، چ بۆ رزق و رۆزیی و، چ بۆبەختیاریی و، چ بۆبەدبەختی، چونکە ئەمانە گشت هەر ئەورۆژە تۆمار کراون، ئەوان لەپزدانی دایکییاندابوون، ئیتر نە بەسەفەرو، نە بەغەزاو جیهاد ناگۆرێن و پاش وپێش ناکەن ﴿ليجعل الله ذلك حسرة فى قلوبهم﴾ و رۆژانی بیروباوەڕی ئاوا، بۆئەوەیە کەخوا بیکاتە مایەی داخ و حەسرەت لەدڵیاندا، چونکە باوەڕیان بەقەدەری خوانییە!. پاشان خوا بیروبۆچونی وا دەداتە دواوەو، دەفەرموێ: ﴿والله يحيي ويميت﴾ خوایە، گیان دەبەخشێ و دەیژێنێ، هەرخۆشیەتی گیان دەباتەوەو دەمرێنێ ﴿والله بما تعملون بصير﴾ و خواش بەهەر کاروکردەوەیە ئێوە ئەنجامی دەدەن بیناو بەئاگایە ﴿[١٥٧] ولئن قتلتم فى سبيل الله﴾ خۆئەگەر ئێوە لەپێناوی رێگای ئایینی خوا بەکوشت چن ﴿أو متم﴾ وەیان لەوکاتەدا بمرن خەریکی جیهادن ﴿لمغفرة من الله ورحمة خير مما يجمعون﴾ دیارە لێبوردن و رەحمەت و میهرەبانی خوا، لەسەرجەم ئەوشتەی ئێوە کۆی دەکەنەوە باشترو چاکترە، خوا جیهادیان پێدەکات، تا لێیان خۆش ببێ، چونکە خەڵکانی کوژراوو مردوو لەبەرەکانی جەنگدا، لەبەرئەوە بەهەشتیان بەگیانی خۆیان کڕیوە، دەگەنە پلەی لێبوردن و میهرەبانی خوا، هەرئەوەیە کەخوا لەجێگایەکی تردا ئەفەرموێ: (إن الله اشترى من المؤمنين أنفسهم وأموالهم بأن لهم الجنة يقاتلون فى سبيل الله فيقتلون ويقتلون وعدا عليه حقا فى التوراة والإنجيل والقرآن ومن أوفى بعهده من الله فاستبشروا ببيعكم الذى بايعتم به وذلك هو الفوز العظيم) (تەوبە: ١١١) یان ئەفەرموێ: (قل بفضل الله ورحمته فبذلك فليفرحوا هو خير مما يجمعون) (یونس: ٥٨) یان دەفەرموێ: (ورحمة ربك خير مما يجمعون) (زوخروف: ٣٢) ئەوئایەتانە هەموو بەڵگەن کە ژیانی ئەم دنیا لەچاو ژیانی ئاخیرەتدا شتێکی براوەو بێ بایەخە، بۆیە خوای میهرەبان دەیداتە هێندێ لەباوەڕداران ﴿[١٥٨] ولئن متم أو قتلتم لإلى الله تحشرون﴾ دڵنیابن ئەگەر لەسەر جێش بمرن، وەیان لەگۆڕەپانی جیهادا بکوژرێن، بێگومانە لەهەردوو حاڵەتەکەدا هەر بۆلای خوا کۆئەکرێنەوەو دێنەوە بەردەستی خۆی، کەوابوو هەوڵبدەن جیهاد بکەن و، رەزامەندی خوا بەدەست بێنن. هەزار رەحمەتی خوا لەم شاعیرە کەلەو بارەوە چەند جوان ئەڵێ: (فإن تك الأبدان للموت أنشئت)، واتە: جا کە بەدەن و جەستەی مرۆڤ بۆمردن دروستکرابن، دەسا کوژرانی بە شیر لەرێی خوادا باشتر نییە؟

**دلۆڤانی و نەرم و نیانی پێغەمبەر ﷺ:**

﴿[١٥٩] **فبما رحمة من الله لنت لهم**﴾ بەهۆی رەحمەت و بەزەیی ومیهرەبانی خواوەیە، تۆ ئەی پێغەمبەر! ﷺ ئەوەندە نەرم و نیان بووی لەگەڵیان، سەرەڕای ئەوهەموو سەرپێچیی و نافەرمانیەیان لەئوحوددا کردیان ﴿**ولو کنت فظا غلیظ القلب لانفضوا من حولك**﴾ خۆئەگەر کەسێکی تووڕەو قسەڕەق ودڵ رەقبای، دەوروبەریان چۆڵ دەکردیی و، لێت دووردەکەوتنەوە ﴿**فاعف عنهم واستغفر لهم وشاورهم فی الأمر**﴾ دەسا تۆ ئازارو هەڵەکانیان ببەخشەو، لەخوایش داوای لێخۆشبوونیان بۆبکە، تاله هەڵەو تاوانەکانیان ببورێ، وە لەتەواوی کارە ستراتیژییەکانیشدا پرس و راو مەشۆرەت و راوێژیان پێبکە.

الجزء الرابع | سورة آل عمران

وَلَئِن مُّتُّمْ أَوْ قُتِلْتُمْ لَإِلَى ٱللَّهِ تُحْشَرُونَ ﴿١٥٨﴾ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ
ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّوا۟ مِنْ حَوْلِكَ
فَٱعْفُ عَنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِى ٱلْأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ
فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَوَكِّلِينَ ﴿١٥٩﴾ إِن يَنصُرْكُمُ ٱللَّهُ
فَلَا غَالِبَ لَكُمْ وَإِن يَخْذُلْكُمْ فَمَن ذَا ٱلَّذِى يَنصُرُكُم مِّنۢ
بَعْدِهِۦ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١٦٠﴾ وَمَا كَانَ لِنَبِىٍّ أَن
يَغُلَّ وَمَن يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ
نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿١٦١﴾ أَفَمَنِ ٱتَّبَعَ رِضْوَٰنَ
ٱللَّهِ كَمَنۢ بَآءَ بِسَخَطٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَمَأْوَىٰهُ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ
﴿١٦٢﴾ هُمْ دَرَجَٰتٌ عِندَ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴿١٦٣﴾
لَقَدْ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ
يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ
وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿١٦٤﴾
أَوَلَمَّآ أَصَٰبَتْكُم مُّصِيبَةٌ قَدْ أَصَبْتُم مِّثْلَيْهَا قُلْتُمْ أَنَّىٰ هَٰذَا
قُلْ هُوَ مِنْ عِندِ أَنفُسِكُمْ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٦٥﴾

٧١

**شووراو راوێژ بنەمایەکی گرنگە لەئیسلامدا:**

ئیمامی (بوخاریی) لە(کتاب التفسیر)ی (فتح الباری: ٥٨٥/٨) دەڵێت: لە (تەورات)دا هاتووە: (إنه ﷺ لیس بِفَظٍّ، ولا غَلیظٍ، ولاسَخّابٍ فی الأسواق، ولایُجْزِءُ السیئةَ، ولکن یَعْفُو ویَصْفَحُ). واتە: پێغەمبەر ﷺ هەرگیز قسەرەق و، دڵرەق نەبووە، کاری خراپیشی بەکاری خراپ، پەرچ نەداوەتەوە، هەمیشە لێبوردەو بپۆشی هەڵە بووە، هەربۆیە بەرامبەر بەهەڵهاتووەکانی (ئوحود)یش زۆر نەرم و نیان بوو. بەڵێ ئەو ئایەتە بناغەو بنەمای مەشۆرەت و راوێژە لە نێوان (ئەمیر) و ئەهلی حەل وعەقددا. پرس و راکردن بەخەڵکانی فامیدە لەگشت کارە گرنگەکانداو، بۆدواییش کارپێکردنی، یاسایەکی بەرزی شکۆداری شەریعەتی ئیسلامە. زاناکانمان دەڵێن: هەر (ئەمیر)ێ تەگبیرو راوێژ بە ئەهلی دین و زانست نەکا، ئەوە بەرکەنار کردنی ئەمیری وا واجیبە، لەکۆنیشەوە وتراوە: پیاوی پرس و راکەر هەرگیز پەشیمان نابێ. هەرکەسێکیش خۆی بەشتێکی عەجایەب و عەنتیکە بزانێ و مەشۆرەت نەکا، ئەوا سەری لێ تێکدەچێ و کارەکەشی لەدەست دەچێ، پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە دەفەرموێ: ((ما نَدمَ مَنِ اسْتَشارَ، ولا خابَ مَنِ اسْتَخارَ، ولا عالَ مَنِ اقْتَصَدَ)). پێغەمبەر پاش پرس و راوێژکردن بەهاوەڵانیو وەرگرتنی رایان، ئیتر بەجوامێرانە بۆ جێبەجێ کردنی کارەکەی لێبڕاوەو پیادەشیکردووە، ئەگەرچی هاوەڵان بۆدوایی لە راکەشیان پەشیمان بوونن، بۆنموونە: پرس و رای پێکردن ، ئایا لەنێو شاری (مەدینە)دا لەگەڵ موشریکانداجەنگ بکەن یا لەدەرەوەی مەدینەدا ، هاوەڵان دەرەوەی مەدینەیان پێ باشبوو، خۆیشی ناوشاری پێ باشبوو، ئەجا پاش لێکۆڵینەوەیەکی ورد، چووە سەر رایەکەی ئەوان و، بەگورجی گەڕایەوە بۆماڵەوە، هەتا خۆی بۆئامادە بکاو، جل و بەرگی جەنگیی بپۆشێ، پاشان هاوەڵان پۆزشیان بۆهێنایەوەو پەشیمان بوونەوە وچونە سەر رایەکەی ئەو، بەڵام پێغەمبەر ﷺ لەرایەکەی خۆی دانەبەزیوو لێبڕا بۆئەنجامدانی. بەڵێ (عەزم)و لێبڕان کەخوا ئەفەرموێ: (فإذا عزمت فتوکل علی الله..) ئاوا دەبێ.

بۆخۆیشی دەفەرموێ: ((لاینبغی لنبی لَبِسَ لأُمَتَهُ أنْ یَضَعَها حتی یَحْكُمَ الله بینه وبین أعدائه..)). واته: بۆ هیچ پێغەمبەرێك ناشێ، جل وبەرگی جەنگیی لەبەرکاو، پاشان هەتا خوا کۆتایی بەو جەنگە دێنێ دایبنێتەوە ، بەڵێ پەیامبەری خوا ﷺ لەگەڵ ئەوەیشدا کە لەئوحوددا تەنیا نۆ کەسی لامایەوە، لە نۆ کەسەکەیش حەوتیان کوژران و شەهیدبوون، کەچی هێشتا خوا هەرفەرمانی پێدەدا کە: داوای لێبوردن بەتێکڕا بکا بۆهاوەڵانی! ﴿فإذا عزمت فتوکل علی الله﴾ ئینجا دوای پرس و راو مەشۆرەت وەختێ لێبڕایت بۆئەنجامدانی کارەکەت، پشت، بەخوا ببەستەو بچۆ کارەکەت پیادەبکە. (تەبەریی) دەڵێت: ئەگەر کارێکت بەلاوە رەواوحەق بوو و، بڕیاریشتدا بیکەیت، بچۆ ئەنجامی بدە، ئەگەرچی لەگەڵ هاوەڵانیشدا راوبۆچوونتان یەك نەگرێتەوە، لەسوورەتی(شوورائایەتی: ٣٨)، بڕێ باسی راوێژو ئەنجوومەنی راوێژ کراوە، دەتوانی بچیتەوە ئەوێ ﴿إن الله یحب المتوکلین﴾ بەراستیی خوا ئەوکەسانەی خۆش ئەوێ، پشت هەربەو دەبەستن ﴿[١٦٠] إن ینصرکم الله فلا غالب لکم﴾ ئەر خوا سەرتان بخات وەك لەبەدردا سەری خستن، ئەوا بێخەم بن هیچ کەسێك ناتوانێ بەسەرتانا زاڵ ببێت ﴿وإن یخذلکم فمن ذا الذی ینصرکم من بعده﴾ خۆئەر وازیشتان لێ بێنێ و، لەیارمەتیتان دەست هەڵبگرێ، دەبێ ئیتر کێ بێ دوای ئەویارمەتیتان بدات؟ ﴿وعلی الله فلیتوکل المؤمنون﴾ دەبا باوەرداران تەنها پشت بەخوا ببەستن کەوابوو سەرکەوتن و تێشکان هەموو بەدەستی خوایە.

## بۆ هیچ پێغەمبەرێ فێڵ و فەرەج ناشێ:

(ئیبن عەباس) دەڵێت: لەڕۆژی (بەدر)دا لەغەنیمەتەکە پارچە قوماشێکی سوور لەنێو خەڵکەکەدا ون بوو، ئەوسا زۆر بێ شەرمانە دووڕووەکان خستیانە سەر پەیامبەر!! ﷺ پاشان ئەم ئایەتەی: (وما کان لنبی..) هات و پاکانەی بۆکرد. (ئیبن کەسیر) ئەڵێت: ئەو ئایەتە لەهەموو گزیی و خیانەتێك پاکانەی بۆ پێغەمبەر کرد، نەك تەنها لەغەنیمەت، بۆیە ئەفەرموێ: ﴿[١٦١] وما کان لنبی ان یغل﴾ بێگومان ناحەقیی و گزیی و خیانەت بۆهیچ پەیامبەرێك شیاو نییەو ناشێ، لەگەڵ خەڵکیدا بیکا، بەتایبەتی لە دەستکەوتی جەنگدا ﴿ومن یغلل یأت بما غل یوم القیامة﴾ هەرکەسێ گزیی و نادادی بکات، ئەوا لەرۆژی قیامەتدا ئەو گزیی و تەشقەڵەیە بەکۆڵیەوەیە -بۆئەوە ئابڕووی بچێت- دەبیندرێ ﴿ثم توفی کل نفس ماکسبت﴾ لەپاشان هەمووکەسێك بەگوێرەی کردەوەکەی خۆی بەتێروتەسەلی سزا دەدرێ ﴿وهم لا یظلمون﴾ و ستەمی هیچ شتێکیشیان لێناکرێ.

## پیاوی ئەمین و ، پیاوی فێڵ و فەرەج لێدەر وەکو یەك نین:

﴿[١٦٢] افمن اتبع رضوان الله کمن باء بسخط من الله﴾ ئاخۆ کەسێ بەئاکاری چاکەوە شوێنی رەزامەندیی وخۆشنودیی خوا کەوتبێ ، واتە: هەرگیز گزیی وخەیانەتی لەمەردوم نەکردبێ، وەکو کەسێك وایە بەخەشم و قینی خواوە گەرابێتەوە، واتە: فرت و فێڵی لەخەڵکی کردبێ؟! بێ سۆ یەکسان نین. لەئایەتی (١٧٣، ١٧٤)ی هەمان سوورەتدا سیفەت و وەسپی ئەوانە روون ئەکاتەوە کە شوێنی رەزامەندیی و خۆشنوودی خوا کەوتوون، وەك ئەفەرموێ: (الذین قال لهم الناس إن الناس قد جمعوا لکم فاخشوهم فزادهم إیمانا و قالوا حسبنا الله ونعم الوکیل * فانقلبوا بنعمة من الله وفضل لم یمسسهم سوء واتبعوا رضوان الله والله ذو الفضل العظیم) ئەوانەیش کەوتنە بەر تورەیی خواوە، سوورەتی (مائیدة: ٨٠) بەدرێژی باسیان دەکاو دەفەرموێ: (تری کثیرا منهم یتولون الذین کفروا لبئس ما قدمت لهم انفسهم أن سخط الله علیهم وفی العذاب هم خالدون). ﴿ومأواه جهنم وبئس المصیر﴾ شوێن وجێگای ئەوکەسە لادەرە دۆزەخەو، دۆزەخیش جێگایەکی زۆرخراپە، بەلام پڕ بەبالاو کالایانە ﴿[١٦٣] هم درجات

عندالله﴾ بۆهەریەك لەئەهلی خێرو، لەئەهلی شەڕ، لای خوا چەند پلەوپایە هەیە، پلەوپایەی باوەڕداران و، پلەوپایەی دووڕووان، کەسێکیشیان ستەمی لێناکرێ ﴿والله بصیر بما یعملون﴾ و خوا بەهەموو کردەوەیان بینایە، هیچ شتێکی لێ ون نابێت.

**بەناردنی پێغەمبەر ﷺ، چاو لە بەری منەتی خواین:**

﴿[١٦٤] لقد من الله علی المؤمنین إذ بعث فیهم رسولا من أنفسهم﴾ بێگومان خوا منەتی نا بەسەر باوەڕداراندا، چونکە هەر لەخۆیان پەیامبەرێکی میهرەبان ودلۆڤانی بۆناردن، هەتا بەئاسانی وتووێژی لەگەڵ بکەن و لێی تێبگەن ﴿یتلوا علیهم آیاته ویزکیهم﴾ ئایەتەکانی خوایان بەسەرا دەخوێنێتەوەو، دڵ ودەرونیشیان لەهەرئاکارێکی دزێوو خراپ پاکژ دەکا ﴿ویعلمهم الکتاب والحکمة﴾ وفێری قورئان وحیکمەت وفەرموودەکانیشیان دەکات ﴿وإن کانوا من قبل لفی ضلال مبین﴾ بێ شك بەرلەهاتنی ئەو پێغەمبەرە، سەرلێشێواو بوون و هیچ شتێکیان نەدەزانی و، زۆریش بەدخوو بوون و، دارو بەردیان دەپەرست، کچیان زیندەبەچاڵ دەکرد، بەژنان سووکایەتییان ئەکرد، بێ سنوور مەیی و شەرابیان دەخواردەوە، لەسوورەتی (جومعە)شدا کورتەیەك هەر لەم باسە دواوین، دەتوانی تەماشای بکەیت.

**هۆی تێکشکانەکەی ئوحود بەدەستی خۆتان بوو:**

﴿[١٦٥] أو لما أصابتکم مصیبة﴾ ئاخۆ کاتێ زیانتان پێگەیشت لەتێکشکانەکەی ڕۆژی ئوحودداو سەرتان سورما، بەتایبەتی کە (٧٠) کەستان شەهیدبوون؟ ﴿قد أصبتم مثلیها﴾ کە بێ سۆ ئێوەش بەر لە(بەدر) دووئەوەندە زیانتان بەوان گەیاند: (٧٠) کەسیان کوژران و، (٧٠) کەسیشیان دیلکران ﴿قلتم أنی هذا﴾ گوتتان: هۆی دووچاربوونمان چی بوو؟ ﴿قل هو من عند أنفسکم﴾ ئەی پێغەمبەر! ﷺ پێیان بڵێ: ئەوە هەر لەخۆتانەوە بوو تووشتان بوو، هۆی سەرەکی لەخۆتانەوە بوو، چونکە ئێوە فەرمانی پێغەمبەرتان شکاند ﴿إن الله علی کل شئ قدیر﴾ بێگومانبێ خوا بەسەر هەمووشتێکدا بەتوانایە، هەرچی حەزبکا ئەیکات. لەم ئایەتەدا هەرچەندە بەکورتیی هۆی تێکشکانی موسڵمانەکان ئەخاتە گەردنی خۆیانەوە، لە ئایەتی (١٥٢)ی هەمان سوورەت زیاتر هۆی ڕووداوەکە ڕوون دەکاتەوە، وەکو لەپێشەوە ئەفەرموێ: (ولقد صدقکم الله وعده إذ تحسونهم بإذنه حتی إذا فشلتم وتنازعتم فی الأمر وعصیتم من بعد ما أراکم ما تحبون منکم من یرید الدنیا ومنکم من یرید الآخرة ثم صرفکم عنهم لیبتلیکم).

﴿[١٦٦] وما أصابکم یوم التقی الجمعان فبإذن الله﴾ ئەوی ڕۆژی بەیەککەیشتنی دوو کۆمەڵەکە -لەجەنگی (ئوحود)دا- دووچارتان بوو، هەموو بڕیارو فەرمانی خوای لەسەربوو ﴿ولیعلم المؤمنین﴾ بۆئەوەی موسڵمانە بەهێزو دامەزراوەکان بناسرێن ودەرکەون ﴿[١٦٧] ولیعلم الذین نافقوا﴾ ئەودووڕووانەش بناسرێن، واتە: (عەبدوڵڵاو هاوڕێکانی) کە ئەوڕۆژە ورەی (٣٠٠) کەسی برد، کەسییەکی سوپاکە بووو، لەگەڵ خۆی گێڕایەوە بۆمەدینە ﴿وقیل لهم تعالوا قاتلوا فی سبیل الله أو ادفعوا﴾ لەڕێگادا موسڵمانەکان پێیانگەیشتن وپێیان گوتن: وەرن لەڕێگای خوادا جەنگ بکەن ، یان دیفاع و بەرگری بکەن ﴿قالوا لو نعلم قتالا لاتبعناکم﴾ کەچی لەوەڵامدا وتیان: ئەگەر بزانین ئێوە تووشی جەنگ وکوشتار دەبن، دڵنیابن دەسمان لێ بەر نەدەدان و، دواتان دەکەوتین و دەجەنگاین، دیارە ئەمەش خۆدزینەوەو جۆرە ڕاکردنێك بوو لەڕاستییەکان، ئینجا قورئان وەڵامێکی ئەمەیان دەداتەوەو ئەفەرموێ: ﴿هم للکفر یومئذ أقرب منهم للإیمان﴾ ئەوانە کە -ئەوڕۆژە ئەوقسەیان کرد- لەکوفرەوە نزیکتربوون تا لەئیمان و باوەڕەوە، چونکە یارمەتی موسڵمانانیان نەداو ئەو بیانووەشیان بەفرۆفێڵ هێنایەوە ﴿یقولون بأفواههم ما لیس فی

قلوبهم﴾ ئەوی بەزار دەیلێن، غەیری ئەوەیە لەدڵیاندایە، واتە: چاك دەزانن تووش دەبن و هاوکاریشتان ناکەن! چونکە دەیانبینی کە چۆن پاش (بەدر) لەهەمولایەکەوە لەشکرکێشی کراوە بۆتۆڵەکردنەوە، ئیتر چۆن جەنگ نابێت، بۆیە خوا فەرمووی:﴿والله أعلم بما یکتمون﴾ خوا چاك دەزانێ بەوەی لەدڵا دەیشارنەوە، درۆدەکەن کەدەڵێن: ئەگەر بزانین ئەوقەی شەڕ دەبن، ئێمەیش دەجەنگاین ﴿[١٦٨] الذین قالوا لإخوانهم وقعدوا﴾ ئەوکەسانە کە بۆخۆیان دانیشتبوون و نەچوو بوونە جەنگ و، بەبراو کەس و کاری شەهیدەکانیشیان دەوت: ﴿لو أطاعونا ما قتلوا﴾ ئەگەر بەگوێی ئێمەیان کردباو، نەڕۆشتنابان بۆ جەنگ، نەدەکوژران! وەکوئێمە نەچووین ونەکوژراین ﴿قل فادرؤا عن انفسکم الموت إن کنتم صادقین﴾ ئەی پێغەمبەر! ﷺ پێیان بڵێ: دەسا مردن لەخۆتان لابدەن ئەگەر ڕاست دەکەن نەچوونە گۆڕەپانی جیهاد هۆکارێکە بۆ نەمردنی مرۆڤ و، دەبێتە هۆی تەمەن درێژیی، چونکە خۆئێوە پاڵتان لێدایەوەو نەچونە غەزاو، دەشمرن.

**ڕێنماییەکانی ئایەتی (١٦٨،١٦٥):**

١- موسیبەت و بەڵاو نەهامەتی، بەرهەمی گوناح و تاوانە، وەکو خوا لەجێگایەکی تردا دەفەرموێ: (وما أصابکم من مصیبة فبما کسبت أیدیکم) ٤٢/٣٠.

٢- هەموو ڕووداوێك پێش خوڵقاندنەکەی لای خوا ئاشکرایە.

٣- هەندێ جار مرۆڤ بڕێ شت دەڵێ، ئەوەندە گران وناقۆڵایە دەیبانە سەر لێواری کوفر.

٤- وشیاریی و، خۆ پاراستن لەمردن ، (قەزاو قەدەر) ناگێڕێتەوە.

**کوژراوانی ڕێی خوا، هەمیشە زیندوون:**

الجزء الرابع | سورة آل عمران

وَمَآ أَصَٰبَكُمْ يَوْمَ ٱلْتَقَى ٱلْجَمْعَانِ فَبِإِذْنِ ٱللَّهِ وَلِيَعْلَمَ ٱلْمُؤْمِنِينَ
١٦٦ وَلِيَعْلَمَ ٱلَّذِينَ نَافَقُوا۟ ۚ وَقِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا۟ قَٰتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ
أَوِ ٱدْفَعُوا۟ ۖ قَالُوا۟ لَوْ نَعْلَمُ قِتَالًا لَّٱتَّبَعْنَٰكُمْ ۗ هُمْ لِلْكُفْرِ
يَوْمَئِذٍ أَقْرَبُ مِنْهُمْ لِلْإِيمَٰنِ ۚ يَقُولُونَ بِأَفْوَٰهِهِم مَّا لَيْسَ
فِى قُلُوبِهِمْ ۗ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يَكْتُمُونَ ١٦٧ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ لِإِخْوَٰنِهِمْ
وَقَعَدُوا۟ لَوْ أَطَاعُونَا مَا قُتِلُوا۟ ۗ قُلْ فَٱدْرَءُوا۟ عَنْ أَنفُسِكُمُ
ٱلْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ١٦٨ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى
سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ١٦٩ فَرِحِينَ
بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ وَيَسْتَبْشِرُونَ بِٱلَّذِينَ لَمْ يَلْحَقُوا۟
بِهِم مِّنْ خَلْفِهِمْ أَلَّا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ١٧٠
الحزب ٨ ۞ يَسْتَبْشِرُونَ بِنِعْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضْلٍ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ
ٱلْمُؤْمِنِينَ ١٧١ ٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ مِنۢ بَعْدِ مَآ
أَصَابَهُمُ ٱلْقَرْحُ ۚ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ مِنْهُمْ وَٱتَّقَوْا۟ أَجْرٌ عَظِيمٌ ١٧٢
ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُوا۟ لَكُمْ فَٱخْشَوْهُمْ
فَزَادَهُمْ إِيمَٰنًا وَقَالُوا۟ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ١٧٣

٧٢ | فانقلبوا بنعمة

لەفەرمودەیەکدا -ئیمامی ئەحمەد لەمەسنەدەکەیدا هێناویەتی- هاتووە: پێغەمبەر ﷺ بەهاوەڵانی فەرموو: کە براکانتان لەئوحود دووچاربوون و شەهیدکران، خوای کارجوان ڕۆحەکانیانی کردووە بەبەری کۆمەڵە پەلەوەرێکی سەوزداو، دەڕۆنە سەر ڕووبارەکانی بەهەشت و، لەمیوەی جۆراو جۆری بەهەشت دەخۆن , پاشان دەچنە بەرچەند گلۆپێکی زێڕین لەبن سێبەری عەرشدا، ئینجا کە ئەوگشت خۆشیی و بەهرەیانە دەبینن ، دەڵێن: ئەی خۆزگا: براو کەس و کارەکانیشمان بەمەیان زانیبا، هەتا لەجیهاد پاڵ نەدەنەوە، پاشان خوا فەرمووی: دەوا من لەباتی ئێوە ئاگاداریان دەکەم، ئەوجا خوا فەرمووی:﴿[١٦٩] ولا تحسبن الذین قتلوا فی سبیل الله أمواتا﴾ وا مەزانن ئەوکەسانەی لەڕێی خوادا کوژران مردوون ﴿بل احیاء عند ربهم یرزقون﴾ بەڵکو زیندوون ولای پەروەردگاریان بژێوی وەردەگرن و رادەبوێرن ، ئێمەش لەدنیادا دەربارەی ژیانی شەهید هەرئەمەندە ئەزانین و، ملکەچی دەقی ئایەتەکانی قورئانین، بەڵێ لەم ئایەتەدا ڕوون نەکراوەتەوە: ئاخۆ خەڵکی دنیا دەزانن ئەو بژێوی و ژیانە چۆنە؟ بەڵام لەسوورەتی (بەقەرە: ١٥٤) دا بەراشکاوی ڕوون کراوەتەوە.

دەڵێ: خەلکی ئەم دنیا لەوجۆرە ژیانە هیچ نازانن و تێناگەن: (ولا تقولوا لمن يقتل في سبيل الله أموات بل أحياء ولكن لا تشعرون). ﴿[١٧٠] فرحين بما آتاهم الله من فضله﴾ بەو نیعمەت و میهرەبانییە خوا پێیداون, دڵخۆش و دڵشاد و خۆشحاڵن ﴿و يستبشرون بالذين لم يلحقوا بهم من خلفهم﴾ ومژدەش بەو موجاهیدانە دەدەن ، کە هێمان بەوان نەگەیشتوون وئێستا لەژینن و زیندوون لەگۆڕەپانی جیهاددان و لەدوای ئەوانەوەن ﴿ألا خوف عليهم ولاهم يحزنون﴾ مژدەیان دەدەنێ کەلە دواڕۆژدا هیچ ترسێکیان نابێ و، هیچ خەفەتێکیش ناخۆن بۆ دنیایان ﴿[١٧١] يستبشرون بنعمة من الله وفضل﴾ بەو نازونیعمەت و بەخشش و بەهرانەی خوا دڵیان خۆشە چونکە پاداشتیان چەند بەرامبەر وەرگرتۆتەوە ﴿وأن الله لا يضيع أجر المؤمنين﴾ بەوەش کەیف خۆشن کەخوای گەورە پاداشتی باوەڕداران لەناونابا.

## ڕێنمایییەکانی ئایەتی (١٦٩،١٧١):

١- شەهید زیندووەو قەت نامرێ، موسڵمانانیش هەروا, بەڵام ژیانی شەهید کامڵ ترە.

٢- شەهید مزگێنی بەموجاهیدانی پاش خۆیان دەدەن ، کە ئەوانیش وەکو ئەمان پاداشیان بۆهەیە. ئیمامی (ترمزیی) ئەم فەرموودە دەهێنێ: (للشهيدِ ستةُ خِصالٍ: يُغْفَرُ في أول دَفْعَةٍ، ويَرَى مَقْعَدَهُ من الجنة، ويُجارُ من عذاب القبر، ويأْمَنُ منَ الفزعِ الأكبرِ، ويُوضَعُ على راسه تاجُ الوقارِ، الياقوتةُ منها خير من الدنيا وما فيها، ويُزَوَّجُ اثنتين وسبعين زوجةً من الحُورِ العينِ، ويَشْفَعُ فى سبعين من أقاربه). واتە: شەهید شەش جۆر خەڵات دەکرێ: لەیەکەم دڵۆپی خوێنییەوە خوا لێیخۆش دەبێت، پێگەی خۆی دەبینێ لەبەهەشتدا، لەسزای گۆڕ دەپارێزرێ، لەترسە گەورەکەی رۆژی سەلا ئەمین دەبێت، تاجی رێزو شەرەفی لەسەر دەنرێت کە: تەنها یاقووتەیەکی لەدنیاو، لەتەواوی ئەوی لەدنیادایە باشترە، (٧٢) (حورولعەین)ی دەدرێتێ، شەفاعەت بۆ (٧٠) کەس لەخزمانی نزیکی خۆی دەکات.

٣- هەرلەبەر فەزیلەتی شەهیدە کە بەکۆی دەنگی زانایان شەهیدی گۆڕەپانی جەنگی نێو کافرو موسڵمان، نە دەشۆردرێ و نە نوێژیشی لەسەر دەکرێ، وەکو ئیمامی (بوخاریی) ئەم فەرموودەیەی هێناوە: ((وادْفَنُوهُمْ بِدِمائِهِمْ..)). پێغەمبەر ﷺ بڕیاریدا (کەشەهیدەکانی ئوحود هەربە خوێنەکەیانەوە بێشۆردرێن بنێژرێن). دەتوانی تەماشایەکی ئایەتی(١٥٤) ی سوورەتی (بەقەرە) بکەیت، چونکە لەوێش هێندێ لەبارەی شەهیدەوە نووسراوە.

### غەزای حەمرائولئەسەد:

بەڵێ.. بێ باوەڕەکان لەسەرەتای جەنگەکەی (ئوحود)ەوە تێکشکان، بەڵام کە دیتیان واموسڵمانەکان سەر شاخەکەیان چۆڵکرد، خێرا بەپەلە گەڕانەوە سەریان وشکاندنیان، ئەوساش پاش تێکشکاندن بۆئەوە بەتەواوی زاڵ بێن بەسەریاندا ویستیان دوایان بکەون، ئەم هەواڵە بەپەیامبەر ﷺ گەیشت، ئەویش دەستبەجێ لەگەڵ (٧٠) کەسدا هەر لەوانە بەشداری جەنگی (ئوحود)یان کردبوو، لەمەدینە دەرچوون و گەیشتنە (حمراء الأسد)، جا کە بێ باوەڕەکان زانییان، ترسیان لێ نیشت و هەڵهاتن، ئەوسا ئەم ئایەتە لەدەسخۆشی و ئافەرینی ئیماندارەکاندا هاتە خوارەوەو فەرمووی: ﴿[١٧٢] الذين استجابوا لله والرسول من بعد ماأصابهم القرح﴾ ئەو هاوەڵانە کەلەپاش بریندار بوونیشیان (لەئوحود) وەڵامی خواو پەیامبەریان دایەوە ﴿للذين أحسنوا منهم واتقوا أجر عظيم﴾ ئەوانەیان کەئاکاری چاکیان کردو، دوای پەیامبەر کەوتن لە (حمراءالأسد)داو، پارێزگاری سنوورەکانی خوا بوون، پاداشتێکی گەورەو فراوانیان بۆهەیە.

**سوێند بەخوا بەتەنهاش بم دوایاندەکەوم:**

﴿[١٧٣] **الذين قال لهم الناس إن الناس قد جمعوا لكم فاخشوهم**﴾ ئەوهاوەڵانەی وا خەڵکێك وەکو (نوعەیمی کوڕی مەسعوود) پێیگوتن: بێگومان ئەوخەڵکانە بۆ لەناوبردنی ئێوە هەموو کۆبوونەتەوەو، ئەیانەوێ گەلەکۆمەڵتان لێبکەن، ئەشێ بترسن‌و خۆتان تووش نەکەن، بەو وتەیەی ویستی هاوەڵان چاوترس بکا وهەڵبێن ، ڕۆژێك بوو (ئەبووسوفیان) بەلەشکرێکی دووهەزار کەسیەوە خۆی ئامادە کردبوو بچێتە سەرمەدینە، بەڵام کەدیتیان موسڵمانەکان ئامادەن، ترس کەوتە دڵیەوەو بەخۆی و سوپاکەیەوە گەڕایەوەو، نوعەیمی بانگکردو گوتی: نوعەیم! بەڵکو بچیت بەرهەرجۆرێك بووبێ، ترس بخەیتە بەرموسڵمانەکان، بەڵکو هەڵبێن و، بۆئەوەی ئەمیش تووشی نەنگ نەبێت ، ئەوجا نوعەیمیش چوو ئەوکارەی ئەنجامداو هەرەشەی لێکردن بەهاتنی لەشرێکی زۆر بۆیان، بەڵام پەیامبەر ﷺ هەر زیکری (حسبنا الله ونعم الوكيل)ی دەخوێندو دەیفەرموو: سوێند بەخوا، ئەگەر بەتەنها خۆیشم مابم، هەردەچم بەدوایاندا ﴿**فزادهم إيمانا**﴾ کەچی بەهەرەشەکەی (نوعەیم) بڕواو ورەیان بەهێزتر بوو ﴿**وقالوا حسبنا الله ونعم الوكيل**﴾ وتیان: ئێمە هەرخوامان بەسە، ئەویش چاکترین چاودێرو یارمەتیدەرە. وتەکەی (نوعەیم): (إن الناس قدجمعوا لكم ..)، بوو بەهۆی زیادبوونی بڕواو وزەیان لەگۆڕەپاندا، زاناکان لەبەر چەند ئایەتێکی ئاوا دەڵێن: (ئیمان) زیادو کەم دەکا، هەرکە زیادبوو، بڕوادارەکەش هەوڵدەدا کاروکردەوەی زیاتر بکا، خۆئەگەر ئیمانەکەی سست و خاو بووەوە، ئەوا کارو کردەوەشی کەم دەکا ﴿[١٧٤] **فانقلبوا بنعمة من الله وفضل**﴾ ئینجا لەئاکامی ئەوپشت بەستنەیان بەخواوەوە، بەبەخشش و نیعمەتێکی فراوانی خواوە گەڕانەوە مەدینە ﴿**لم يمسسهم سوء**﴾ و تووشی هیچ ناخۆشیی و ناڕەحەتییەکیش نەبوون، لەو هەرەشانە دەیانکرد ﴿**واتبعوا رضوان الله**﴾ هەر لەڕەزامەندیی و خۆشنوودی خوا دەگەڕان ﴿**والله ذوفضل عظيم**﴾ خواش خاوەنی بەخشش و بەهرەیەکی زۆر گەورەیە ﴿[١٧٥] **إنما ذلكم الشيطان يخوف أولياءه**﴾ دیارە ئەوهەرەشەی (نوعەیم)ـە، هەرەشەی شەیتانەو دەیەوێ ئێوە بەهاو دۆستانی خۆی بترسێنێت. واتە: ئەوکارەی (نوعەیم)ـە هەر لەکاری شەیتان دەکا ﴿**فلا تخافوهم وخافوني إن كنتم مؤمنين**﴾ جائەگەر باوەڕتان بەهێزە، لەوان مەترسن ، لەخۆم بترسن ، خوا دەفەرموێ (أليس الله بكاف عبده ويخوفونك بالذين من دونه) هەتا دەگاتە (قل حسبی الله عليه يتوكل المتوكلون).

الجزء الرابع — سورة آل عمران

فَٱنقَلَبُواْ بِنِعۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضۡلٖ لَّمۡ يَمۡسَسۡهُمۡ سُوٓءٞ وَٱتَّبَعُواْ
رِضۡوَٰنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ ذُو فَضۡلٍ عَظِيمٍ ﴿١٧٤﴾ إِنَّمَا ذَٰلِكُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ
يُخَوِّفُ أَوۡلِيَآءَهُۥ فَلَا تَخَافُوهُمۡ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿١٧٥﴾
وَلَا يَحۡزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡكُفۡرِۚ إِنَّهُمۡ لَن يَضُرُّواْ ٱللَّهَ
شَيۡـٔٗاۗ يُرِيدُ ٱللَّهُ أَلَّا يَجۡعَلَ لَهُمۡ حَظّٗا فِي ٱلۡأٓخِرَةِۖ وَلَهُمۡ عَذَابٌ
عَظِيمٌ ﴿١٧٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱشۡتَرَوُاْ ٱلۡكُفۡرَ بِٱلۡإِيمَٰنِ لَن يَضُرُّواْ
ٱللَّهَ شَيۡـٔٗا وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿١٧٧﴾ وَلَا يَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ
أَنَّمَا نُمۡلِي لَهُمۡ خَيۡرٞ لِّأَنفُسِهِمۡۚ إِنَّمَا نُمۡلِي لَهُمۡ لِيَزۡدَادُوٓاْ إِثۡمٗاۖ
وَلَهُمۡ عَذَابٞ مُّهِينٞ ﴿١٧٨﴾ مَّا كَانَ ٱللَّهُ لِيَذَرَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ عَلَىٰ مَآ
أَنتُمۡ عَلَيۡهِ حَتَّىٰ يَمِيزَ ٱلۡخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُطۡلِعَكُمۡ
عَلَى ٱلۡغَيۡبِ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَجۡتَبِي مِن رُّسُلِهِۦ مَن يَشَآءُۖ فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ
وَرُسُلِهِۦۚ وَإِن تُؤۡمِنُواْ وَتَتَّقُواْ فَلَكُمۡ أَجۡرٌ عَظِيمٞ ﴿١٧٩﴾ وَلَا
يَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبۡخَلُونَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ هُوَ خَيۡرٗا
لَّهُمۖ بَلۡ هُوَ شَرّٞ لَّهُمۡۖ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُواْ بِهِۦ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ
وَلِلَّهِ مِيرَٰثُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ﴿١٨٠﴾

٧٣

رێنماییەکانی ئایەتی (١٧٢-١٧٥):

١- مەزنی و فەزیلەتی ئاکاری چاك وتەقوا، کە بێگومان هەردووکیان کلیلی هەموو خێرێکن.

٢- ڕێزو فەزڵی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لەبەرامبەر خەڵکی ترەوەو، قەدرو نرخیان بەلای خواوە.

٣- گەورەیی و بەرەکەتی وتنی وشەی (حسبنا الله ونعم الوکیل) لەکاتی تەنگانەدا بەتایبەت پێغەمبەران (محمد)و (ئیبراهیم/علی نبینا وعلیهم أفضل الصلاة والسلام) لە قۆناغە تاڵو تفتەکانی ژیانیاندا دەیانگوت.

٤- شەیتان هەمووکات بەدۆستانی خۆی، هەڕەشە لەبڕواداران دەکاو دەیانترسێنێ، جا دەبێ موسڵمانان لەخوا نەبێ لەکەس نەترسن و، تەوەکولیشیان هەر بەوبێ.

**تەسلییەو دڵدانەوەی پێغەمبەر ﷺ:**

پێغەمبەر ئەوەندە حەزی دەکرد خوانەناسەکان ئیمان بێنن، گەلێ جار تووشی خەم وخەفەت دەبوو، ئەوجا خواش فەرمووی: ﴿[١٧٦] ولایحزنك الذین یسارعون فی الکفر﴾ بەو دووڕووو کافرانە خەفەتبار مەبە، کەپەلە دەکەن بۆ دژایەتی تۆ ﴿إنهم لن یضروا الله شیئا﴾ ئەوانە هەرگیز ناتوانن کەمترین زیانێك بەخوا بگەیەنن ﴿یریدالله ان لا یجعل لهم حظا فی الآخرة﴾ خوا ئەیەوێ لە دوارۆژدا هیچ بەشێکیان نەبێ ، چونکە بۆخۆیان لەم ژیانەدا، بەئارەزووی خۆیان ڕێگەی لارو چەوت هەڵدەبژێرن ﴿ولهم عذاب عظیم﴾ وبۆیە لەباتی پاداشی چاك، سزایەکی گەورەیان بۆهەیە ﴿[١٧٧] إن الذین اشتروا الکفر بالإیمان﴾ بەڕاستی ئەوکەسانەی وا لەباتی باوەڕ، بێ بڕواییان کڕی، واتە: ئیمانیان گۆڕیەوە، بەکوفرو بێ دینی ﴿لن یضرواالله شیئا ولهم عذاب الیم﴾ هەرگیز ناتوانن بەهیچ جۆرێك زیانێ بەخوا بگەیەنن و، سزایەکی ئێش پێگەیەنەریشیان بۆهەیە ﴿[١٧٨] ولایحسبن الذین کفروا أنما نملی لهم خیر لأنفسهم﴾ با ئەوکەسانەی کە ڕێبازی بێ باوەڕییان گرتووە، پێیان وا نەبێ ئەومۆڵەت و نیعمەتانە پێیان دەبەخشین، قازانج و خێرە بۆیان ﴿إنما نملی لهم لیزدادوا إثما﴾ بێگومان هەر لەبەرئەوەیە تەمەنیان درێژ ئەکەین و مۆڵەتیان ئەدەین، کەباری گوناحیان زیاتر بێ ﴿ولهم عذاب مهین﴾ و سزایەکی پەستکەرو ئابڕووبەریشیان بۆهەیە، لەئایەتی: (٩٤،٩٥ی/ ئەعراف)دا ڕوون کراوەتەوە کە بۆیە بەڵاو نەهامەتیی درا بەسەریاندا، بەڵکو بگەڕێنەوە لای خوا، جاکە هەر درێژەیان بە ملهوڕی خۆیاندا، ئەوسا خوا گوزەرانی خۆشی پێدان و، ئەوانیش سەرگەرمبوون پێی، هەتا کتوپڕ گرتوونی، وەك لەجێگایەکی تردا ئەفەرموێ: (وما أرسلنا فی قریة من نبی إلا أخذنا أهلها بالباساء والضراء لعلهم یضرعون ثم بدلنا مکان السیئة الحسنة حتی عفوا وقالوا قد مس آباءنا الضراء والسراء فأخذناهم بغتة وهم لا یشعرون). و لەئایەتی (٤٢-٤٣): ئەنعام)دا ئەفەرموێ: (ولقد أرسلنا إلی أمم من قبلك فأخذناهم بالبأساء والضرآء لعلهم یتضرعون * فلولا إذجاءهم بأسنا تضرعوا..﴾ دیسان، لەئایەتی (٤٤)ی (ئەنعام)دا ئەفەرموێ: (أخذناهم بغتة فإذا هم مبلسون) ﴿[١٧٩] ماکان الله لیذر المؤمنین علی ماانتم علیه﴾ خوا هیچ کات بڕوادارانی بێ تاقیکردنەوەو هەڵسەنگاندن، بەوحاڵەتەوە وان لەسەری، (کە دووڕووو دڵسۆز، خەمخۆرو پاك تێکەڵن) نەهێشتۆتەوە، بەڵکو هەندێ جار بۆپالاوتنی چاك و خراپ، بێ ئارام و بەئارام جۆرە بەڵاو نەهامەتی دەنێرێ ﴿حتی یمیز الخبیث من الطیب﴾ هەتا پیس و پاك لەیەك جیا بکاتەوە، بێگومان ڕووداوەکەی (ئوحود)یش چاکتر هەڵسەنگاندن و تاقیکردنەوەبوو، ئەوەبوو (عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی) وەك لەپێشەوە وتمان بەخۆیی و سێ سەد کەسەوە وەڕەی بەزیی و، نیفاقی دەرکەوت ، کەوابوو داوای جیهادو هێندێ تەکلیف لەراست وناراست، دڵسۆزو ناپاك لێکدەکاتەوە ﴿وما کان الله لیطلعکم علی الغیب﴾ خۆ خوا ئاگاداری کارە نادیارەکانیشی نەکردوون وغەیب نازانن، هەتا بەدڵ بزانن کێ چاکەو کێ خراپە.. بەڵکو هەر دەبێ تاقیکردنەوەو ڕووداو، مرۆڤی چاك و خراپ لەیەك جیابکاتەوە، وەك لە ئوحوددا ﴿ولکن الله یجتبی من رسله من یشاء﴾ بەلام دەکرێ خوا لەناو پەیامبەرانی خۆیدا مەیلی هەرکەسێکی

ببیٚ، هەڵبژێری و، هەندیٚ جاریش بیٚ تاقیکردنەوە ئاگاداری بکات کە: فلاٚنە کەس ناپاکە، ڕازو نیازی بەدفەڕە وەکو لەجێگایەکی تردا دەفەرمویٚ: (عالم الغیب فلا یظهر علی غیبه إلا من ارتضی من رسول).. ﴿فآمنوا بالله ورسله﴾ دەسا دەبیٚ بڕوایەکی پتەوو ڕاستەقینەتان بەخواو بەپەیامبەرانی هەبیٚ ﴿وإن تؤمنوا وتتقوا فلکم أجر عظیم﴾ ئەر باوەڕێکی ڕاستەقینەتان هێناو خۆیشتان لەسنوورەکان پاراست ودەرنەچوون، کرێی و پاداشتێکی یەکجار گەورەتان پێئەدریٚ. لێرەدا جیهادو جەنگی گۆڕەپان کۆتایی دێت. باس وخواسی ڕووداوەکەی (ئوحود) دەپێچرێتەوە.. هەرچەند ریوایەتێك دەڵیٚ ئایەتی (١٨٠) کەئێستا دێت هەر لەو (٦٠) ئایەتەیە کە سەبارەت بەرووداوەکەی ئوحود هاتوونە.

**چکووس و رژد مەبن:**

ئینجا موسڵمانان هەڵدەنێت بۆ بەختکردنی ماڵ و دارایی لەرێگەی خوادا، بۆیە ئەفەرمویٚ: ﴿[١٨٠] ولا یحسبن الذین یبخلون بما آتاهم الله من فضله هو خیرا لهم﴾ با ئەوکەسانە کەخوا لە فەزڵ و میهرەبانیی خۆی ماڵی پێی بەخشیوون و، ڕژدیی وچروکی تێدا دەکەن، وا نەزانن ئەو چکووسیی و چرووکییە قازانجیانە ﴿بل هو شر لهم﴾ نەخێر، خێرو قازانج نییە بۆیان، بەڵکو مایەی زەرەرو زیانیانە، چونکە ﴿سیطوقون ما بخلوا به یوم القیامة﴾ لەرۆژی قیامەتدا بەوسامانەی چرووکییان تێدا کردووە، تۆق دەکرێتە ملیان، پێشەوا (بوخاریی) لە (ئەبوو هورەیرە)وە دەگێڕێتەوە کە پەیامبەر ﷺ دەفەرمویٚ: ((مَنْ آتاهُ الله مالا فلم یُؤَدّ زکاتَهُ، مُثّلَ له مالُهُ شُجاعًا أقْرَعَ (أی ثُعْبانًا عظیمًا) له زَبِیبَتَانِ، یُطَوّقُهُ یوم القیامة، یَأْخُذُ بِلِهْزِمَتَیْهِ (یعنی بِشِدْقَیْهِ) یقول: أنَا مَالُك، أنَا كَنْزُكَ)) لەپاشان ئەم ئایەتی (١٨٠) یەی خوێندەوە. بوخاریی (کتاب التفسیر/٤٥٦٥) بابی: (ولایحسبن الذیت یبخلون بماآتاهم الله..) واتە: ئەوی خوا ماڵی پێدەداو، دەگاتە سنووری زەکات وزەکاتی لێنادات، لەرۆژی قیامەتدا دەکرێتە ئەژدیهایەکی سەرتاس و دووخاڵی ڕەش، بەسەرچاویەوەن ، نیشانەی زۆر ترسناکیە، ئەوسا هەردووچەناکەی دەگرێت وپێی دەڵیٚ: من ماڵەکەی تۆم، گەنجەکەی تۆم ﴿ولله میراث السموات والأرض﴾ بێگومانیشبن کە: ئاسمانەکان و زەوی هەر بۆخوا دەمێننەوەو، هی ئەون، کەوابوو ببەخشن و چرووکی مەکەن ﴿والله بما تعملون خبیر﴾ و خواش بەوکارە ئێوە ئەیکەن زۆر بەئاگایە.

**ڕێنماییەکانی ئایەتی (١٧٩-١٨٠):**

١- بە سپاردەو تەکلیفەکانی خوا، موسڵمانی ڕاستبێژو، درۆزن لێك دەکرێنەوە.

٢- کارە غەیب ونادیارەکان تەنها خوا دەیانزانیٚ، مەگەر یەکیٚ لەپێغەمبەرانی خۆی لیٚ بەئاگا بکا.

٣- بەهای بەهەشت: تەنها باوەڕو تەقوایە.

٤- ڕژدیی و بەخیلیی لەماڵ و ساماندا، کارێکی بەدفەڕو نەگبەتیە بۆ خاوەنەکەی.

٥- هەرکەسیٚ خوا ماڵێکی پێداو هەقی شەرعیی لێنەدا، بەوماڵەی خۆیەوە لەرۆژی بەرێدا سزا ئەدریٚ، بەبەڵگەی ئەم ئایەتەو، ئەو ئایەتەی (تەوبە)یە کەدەفەرمویٚ: (والذین یکنزون الذهب والفضة..) لەگەڵ چەندین فەرموودەدا.

**خوا لەموشریکان بە هەرەشەیە:**

(ئیبن عەباس) دەڵیٚ: کاتیٚ خوا فەرمووی: (من ذا الذی یقرض الله قرضا حسنا) جوولەکەکان بۆ لاوازکردنی وزەی موسڵمانان گوتیان: ئێمە دەوڵەمەندو داراین، خوایش هەژارو بیٚ نەوا، بۆیە داوای قەرزمان لێدەکات! جا بۆ

پووچەڵکردنەوەی قسەکەیان خوا فەرمووی: ﴿[١٨١] لقد سمع الله قول الذین قالوا إن الله فقیر ونحن اغنیاء﴾ بێگومان خوا وتەی ئەوکەسانەی بیست کە وتیان: خوا هەژارەو، ئێمە داراو دەوڵەمەندین ﴿سنکتب ماقالوا وقتلهم الأنبیاء بغیر حق﴾ بێ سۆ ئەوقسەو گوفتارەیان و، ئەو بەناهەق کوشتنەی پەیامبەرانەیان لەسەردەنووسین و تۆڵەیان لێدەکەینەوە ﴿ونقول ذوقوا عذاب الحریق﴾ تۆڵەیان لێدەسێنین‌و پێیشیان دەڵێن: دەسا سزای سووتێنەر بچێژن ﴿[١٨٢] ذلك بما قدمت ایدیکم﴾ ئەو سزایەش لەبەرئەوەیە کە ئێوە ئەوکارانەتان دەکرد ﴿وان الله لیس بظلام للعبید﴾ و بیشزانن کە: هەرگیز خوا غەدر لەعەبدان ناکا ﴿[١٨٣] الذین قالوا إن الله عهد إلینا﴾ ئەو جوولەکانەی گوتیان: بێگومان ئێمە خوا لەتەوراتدا وەسیەتی بۆ کردووین ﴿الا نؤمن لرسول حتی یأتینا بقربان تأکله النار﴾ کە باوەڕ بەهیچ پەیامبەرێك نەکەین هەتا موجیزەیەك دێنێ و، بەچاوی خۆمان دەیبینین و، موجیزەکەیش ئەمەبێت کەهەرکەسێك خێرو صەدەقەیەك بکات ئاگرێك (هەورە بروسکە)یەك لەئاسمانەوە بێت بیخوات، واتە: (بیسوتێنێ) ئەوجا باوەڕی پێدەکەین ﴿قل قد جاءکم رسل من قبلی بالبینات وبالذی قلتم﴾ ئەی پێغەمبەر! ﷺ پێیان بڵێ: خۆ چەندان پێغەمبەرتان پێش من بە نیشانە گەلێ ئاشکراو بەوی گوتتان بۆهات ﴿فلم قتلتموهم إن کنتم صادقین﴾ دەسا بۆ کوشتووتان و، باوەڕتان پێنەکردن، ئەگەر ڕاست دەکەن لەم قسەدا، دیارە ئێوە خەڵکێکی درۆزن وناراستن ﴿[١٨٤] فإن کذبوك فقد کذب رسل من قبلك﴾ جائەر بەدرۆزنیان دانایت و باوەڕیان پێنەهێنایت، هیچ خەم وخەفەت مەخۆ چونکە گەلێ لە پێغەمبەرانی بەرلەتۆیش، بەدرۆزنیان دانان و باوەڕیان پێنەهێنان ﴿جاؤا بالبینات والزبر والکتاب المنیر﴾ بە کۆمەڵێ بەڵگەو نیشانەی ئاشکراو، کتێبی پڕ لەحیکمەت و نامەی شارەزاکەرەوە هاتنە لای هۆزەکەیان و باوەڕیشیان پێنەکردن، کەواتە تۆیش وەکو ئەوان.

الجزء الرابع — سورة آل عمران

لَقَدۡ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوۡلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٞ وَنَحۡنُ أَغۡنِيَآءُۘ سَنَكۡتُبُ مَا قَالُواْ وَقَتۡلَهُمُ ٱلۡأَنۢبِيَآءَ بِغَيۡرِ حَقّٖ وَنَقُولُ ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلۡحَرِيقِ ﴿١٨١﴾ ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيكُمۡ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيۡسَ بِظَلَّامٖ لِّلۡعَبِيدِ ﴿١٨٢﴾ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ عَهِدَ إِلَيۡنَآ أَلَّا نُؤۡمِنَ لِرَسُولٍ حَتَّىٰ يَأۡتِيَنَا بِقُرۡبَانٖ تَأۡكُلُهُ ٱلنَّارُۗ قُلۡ قَدۡ جَآءَكُمۡ رُسُلٞ مِّن قَبۡلِي بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَبِٱلَّذِي قُلۡتُمۡ فَلِمَ قَتَلۡتُمُوهُمۡ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿١٨٣﴾ فَإِن كَذَّبُوكَ فَقَدۡ كُذِّبَ رُسُلٞ مِّن قَبۡلِكَ جَآءُو بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلزُّبُرِ وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُنِيرِ ﴿١٨٤﴾ كُلُّ نَفۡسٖ ذَآئِقَةُ ٱلۡمَوۡتِۗ وَإِنَّمَا تُوَفَّوۡنَ أُجُورَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۖ فَمَن زُحۡزِحَ عَنِ ٱلنَّارِ وَأُدۡخِلَ ٱلۡجَنَّةَ فَقَدۡ فَازَۗ وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلۡغُرُورِ ﴿١٨٥﴾ ۞ لَتُبۡلَوُنَّ فِيٓ أَمۡوَٰلِكُمۡ وَأَنفُسِكُمۡ وَلَتَسۡمَعُنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكُمۡ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُوٓاْ أَذٗى كَثِيرٗاۚ وَإِن تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ذَٰلِكَ مِنۡ عَزۡمِ ٱلۡأُمُورِ ﴿١٨٦﴾

ربع الحزب ٨

وَإِذۡ أَخَذَ — ٧٤

### ڕێنماییەکانی ئایەتی (١٨١-١٨٤):

١- کوفری جوولەکەو بێ ئەدەبییان لەگەڵ خواو پێغەمبەرانی ئەودا، لەڕادە بەدەر بوو.

٢- کوشتنی ئەو گشت پێغەمبەرانە لەلایەن یەهوودەوە.

٣- ئاشکراکردنی ئەودرۆیانەی جوولەکە کە: گوایە خوا پەیمانی لەگەڵ بەستوون: هەر پێغەمبەرێ هاتەلایان بڕوای پێنەکەن، هەتا قوربانیەك دەکا و ئەوساش ئاگرێ پەیدادەبێ و دەیخوات.

٤- سەرەخۆشیی پێغەمبەرو هەڵنانیشی بۆخۆراگرتن لەبەرامبەر تورەهاتی یەهوودەوە.

## هەموو کەسێك تامی مردن دەچێژێ:

﴿١٨٥ كل نفس ذائقة الموت﴾ هەمووکەسێك بێ جیاوازیی تامی مردن دەچێژێ، وەك خوا خۆی لەجێگایەکی تردا دەفەرموێ: (كل من عليها فان) هەرچی لەم دنیایەدایە تیادەچێ ﴿وإنما توفون اجوركم يوم القيامة﴾ ڕۆژی قیامەت، گشت کرێ وپاداشی خۆتانتان دەدرێتەوە ﴿فمن زحزح عن النار وادخل الجنة فقد فاز﴾ ئینجا هەرکەسێ لەئاگر دوور خرایەوەو برایە بەهەشتەوە، بێ شك سەرفرازو سەرکەوتو دەبێ ﴿وما الحياة الدنيا إلا متاع الغرور﴾ ژیانی ئەم دنیایەش، تەنها خۆشی و لەزەتێکی کەم و چەواشەکارو فریودەرو، خشتەبەرە، کەواتە وشیار بن! پێغەمبەری خوا فەرمووی: ((موضع سوط فى الجنة خير من الدنيا وما فيها)) ئەوجا گوتی: ئەرحەزیش دەکەن ئایەتی: (فمن زحزح عن النار وأدخل الجنة فقد فاز) بخوێننەوە.

### چەند ڕێنماییەك:

١- لەکاتی سەرەمەرگدا زیکری (لاإله إلا الله) بخەنە سەر زاری نەخۆشەوە .

٢- سوورەتی (یس)ی بۆ بخوێننەوە، بەڵکو سزاو نارەحەتی گیانکێشانی بۆ ئاسان ببێ، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمویی: ((ما مِنْ مَيّتٍ يُقْرَأُ عنده يس إلا هُوّنَ عليه)) واتە: هەرنەخۆشێك لەگیانەلآبێ و، سوورەتی(یاسین)ی لەسەر بخوێنرێت، پلە نارەحەتەکانی سەرەمەرگی بۆ ئاسان دەکرێت. یان ئەوفەرموودە کە (ئەباداود) ریوایەتی دەکا: ((إقْرَأوا يس على موتاكم)) واتە: سوورەتی (یاسین) بۆ نەخۆشەکانتان بخوێنن. هەرچەندە ئەم فەرموودەیە لاوازەو لەسەنەدەکەیدا کێشەی تێدایە ، دەتوانی بۆ ئەم مەبەستە سەردانی تەفسیری قورتوبی بکەیت بۆ تەفسیری هەمان ئایەت.

٣- کاتێ کە مرد دەبێ هەردوو چاوی بنرێ بەیەکا، ئەوسا بشۆردرێ و کفن بکرێ و نوێژی لەسەر بکرێ وبەپەلەش بگەیەنرێتە گۆڕستان و لە کڵکۆی موسڵمانانندا بەپەلە بەخاك بسپێردرێ، چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((إسْرَعُوا بالجنازة فإن تَكُ صالحةً فخير تقدمونها إليه، وإن تك غيرَ ذلك فشر تَضَعُونَهُ عَنْ رِقابِكُمْ))، واتە: بەپەلە تەرمی مردوو بگەیەننە گۆڕستان، چونکە ئەر ئاکار چاك بێت، ئەوا زوو دەیگەیەننە جێی خۆش، خۆئەر بەدکاریش بێت، شەرێکەو زوو لەکۆڵتان دەبێتەوە.

## ئیماندار بەر ئەزموون دەکەوێ:

﴿١٨٦ لتبلون فى اموالكم وانفسكم﴾ سوێند بەخوا گیانو داراییتان (ئەی موسڵمانان!) بەبەڵاو نەهامەت بەر تاقیکردنەوە دەکەون، واتە: دەبێ بچنە گۆڕەپانی جیهادو ماڵ و سامان بەخت بکەن و توشی زیانی سەروماڵی ببن. لەجێگایەکی تردا ئەو تاقیکردنەوەیە روونکراوەتەوە، وەك لەئایەتی (١٥٥،١٥٧)ی بەقەرەدا هاتووەو دەفەرموێ: (ولنبلونكم بشئ من الخوف والجوع ونقص من الأموال والأنفس والثمرات وبشر الصابرين * الذين إذا أصابتهم مصيبة قالوا إنا لله وإنا إليه راجعون * أولئك عليهم صلوات من ربهم ورحمة وأولئك هم المهتدون). ﴿ولتسمعن من الذين أوتوا الكتاب من قبلكم ومن الذين أشركوا أذى كثيرا﴾ وە لەوانەی کتێبیان پێدراوە لە پێش ئێوەوە و لەهاوبەشدانەرانەوە زۆرو زەبەندە قسەی نابەجێ و ناخۆش ئەبیستن و، پێی دڵتەنگ دەبن، بەڵام... ﴿وإن تصبروا وتتقوا﴾ ئەگەر ئێوە لەبەرامبەر وتەکانیانەوە خۆگربن و، لە کردارو وتارتاندا پارێز بکەن ، سەرکەوتوو دەبن، وەك ئەفەرموێ: ﴿فإن ذلك من عزم الأمور﴾ بەراستیی کاری وا، لەکاری مەردانو جوامێران دەچێت، دەبێ بایەخ و گرنگی

بدرێتێ، سروشتی بوونەوەرەکە: هەرکەسێك بەرەو خوابچێت، دەبێ هەرکەس بەپێی توندوتۆڵی دینەکەی خۆی، ئازارو بێزار بچێژێ.

**رێنماییەکانی ئایەتی (١٨٥-١٨٦):**

١- دنیا جێگای پاداش و تۆڵە نییە، بەڵکو جێگای هەوڵ و کۆشش و کاروکردەوەیە.

٢- رزگاریی و، بەختیاری راستەقینە دوور بوونە لە ئاگرو، چوونە ناو بەهشتە.

٣- ژیانی ئەم دنیا کالآیەکە، نابێ پشتی پێوە ببەسترێ.

٤- تاقیبوونەوە کارێکی زەروریی و حەتمییە، جا لەبەرامبەریەوە سەبرو تەقوا بۆ موسڵمانان پێویستە.

٥- جوولەکەو گاورو موشریکان، هەردەم ئازاری موسڵمانان دەدەن، ئەوەبوو (فەحاس)ی یەهوودیی وتی: ئێمە دەوڵەمەندین و، خواش هەژاروو بێ دەسەڵات! نەصاراش وتیان: عوزەیر کوڕی خوایە! موشریکان وتیان: (لات و عوزاو مەنات) شەریك و هاوبەشی خوان! (عەبدوڵڵای کوڕی سەلوول)یش بەپێغەمبەری گوت: نزیکی کۆڕەکانمان مەبەوە، (کەعبی کوڕی ئەشرەف) بەهۆنراوەی نابەجێ و ناقۆڵا ئازاری پێغەمبەرو موسڵمانەکانی دەدا ، گەلێ جار بەرامبەر بە ژنە موسڵمانەکان بەخراپە دەدوا، بۆیە لەئەنجامدا پێغەمبەر ﷺ (موحەممەدی کوڕی مەسلەمە)ی ناردو فورسەتی لێ هێناو کوشتیی.

الجزء الرابع | سورة آل عمران

وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ لَتُبَيِّنُنَّهُۥ لِلنَّاسِ وَلَا تَكْتُمُونَهُۥ فَنَبَذُوهُ وَرَآءَ ظُهُورِهِمْ وَٱشْتَرَوْا۟ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا ۖ فَبِئْسَ مَا يَشْتَرُونَ ﴿١٨٧﴾ لَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَآ أَتَوا۟ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُوا۟ بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا۟ فَلَا تَحْسَبَنَّهُم بِمَفَازَةٍ مِّنَ ٱلْعَذَابِ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٨٨﴾ وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٨٩﴾ إِنَّ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا سُبْحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٩١﴾ رَبَّنَآ إِنَّكَ مَن تُدْخِلِ ٱلنَّارَ فَقَدْ أَخْزَيْتَهُۥ ۖ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴿١٩٢﴾ رَّبَّنَآ إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِى لِلْإِيمَٰنِ أَنْ ءَامِنُوا۟ بِرَبِّكُمْ فَـَٔامَنَّا ۚ رَبَّنَا فَٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّـَٔاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ ٱلْأَبْرَارِ ﴿١٩٣﴾ رَبَّنَا وَءَاتِنَا مَا وَعَدتَّنَا عَلَىٰ رُسُلِكَ وَلَا تُخْزِنَا يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ إِنَّكَ لَا تُخْلِفُ ٱلْمِيعَادَ ﴿١٩٤﴾

٧٥

**خاوەن کتێبەکان هەق دەشارنەوە:**

﴿[١٨٧] وإذ أخذالله ميثاق الذين أوتوا الكتاب﴾ باسی ئەو خاوەننامانە بەکە خوا پەیمانی لێوەرگرتن ﴿لتبيننه للناس ولاتكتمونه﴾ کە بەرێکوپێکی -ئەونامەیە بۆیان هاتووە- بەخەڵکی راگەیەنن و، هیچی لێ نەشارنەوە ﴿فنبذوه وراء ظهورهم﴾ کەچی بەڵێنەکەیان فڕێدایە پشتیانەوە و پشتگوێیان خست ! ﴿واشتروا به ثمنا قليلا﴾ و بەهایەکی کەمیان پێکڕی، واتە: تەورات و ئینجیلیان بەدنیایەکی کەم فرۆشت ! ﴿فبئس ما يشترون﴾ ئای چەندە خراپ بوو ئەوی کڕییان و سەودایان پێکرد ، چونکە لەباتی قیامەتی نەبڕاوە، دنیای فانی و تیاچوویان وەرگرت، (ئیبن کەسیر) دەڵێت: ئەم ئایەتە هەڕەشەیە بۆگشت زانایەك، ئەوانەیان گەلێ جار ڕاستییەکان لەبەردەم دەسەڵاتداراندا دەشارنەوە، یان لەبەرامبەر تەماحێکی دنیاوە، یان سروشتیان تێکچووە، هەرکامێکیان بێت، لای خوا کارێکی زۆر دزێوو قێزەونە، هەقە هەرگیز لەجادە ڕاستەکە کلا نەبن. ئەبوو سەعیدی (خودری)یش دەڵێت: لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ کۆمەڵێ دووڕوو هەبوون، هەرکە پێغەمبەر ﷺ چووبا بۆ غەزایەك، خۆیان لێدەدزییەوەو، کەیفیشیان پێ دەهات، کەپێغەمبەر ﷺ دەشهاتەوە پۆزشیان بۆدەهێنایەوەو، هێمان پێشیان خۆشبوو سوپاس بکرێن، ئەوجا ئەو ئایەتەهات و فەرمووی: ﴿[١٨٨] لا تحسبن الذين

﴿يفرحون بما اتوا﴾ وا مەزانە ئەوکەسانەی دڵشادن بەوەی کە کردوویانە ﴿ويحبون أن يحمدوا بما لم يفعلوا﴾ و حەزیش دەکەن بۆکاریٚ کەنەشیانکردووە، تاریف و سوپاس بکریٚن ﴿فلا تحسبنهم بمفازة من العذاب﴾ تۆ وامەزانە لەجەزرەبە رزگاریان دەبیٚ. (ئیبن عەبباس) دەڵیٚ: ئەم ئایەتە سەبارەت بەخاوەننامەکان هات، پیٚغەمبەر ﷺ شتیٚکی لیٚ پرسین، ئەوانیش لیٚیان شاردەوەو شتیٚکی دیکەیان پیٚگوت، کەچی دواییش بەوکارەیان زۆر دڵشاد و خۆشحاڵ بوون! ﴿ولهم عذاب اليم﴾ وسزای ئیٚش پیٚگەیەنەریان بۆهەیە ﴿[١٨٩] ولله ملك السموات والأرض والله على كل شئ قدير﴾ و خاوەندارییٚتی ئاسمانەکان و زەویی هەر بۆخوایەو، هیچ شتیٚکی لیٚ بزر نابیٚت، چونکە بەسەر هەمووشتیٚکدا دەسەڵاتدارە.

## ڕیٚنماییەکانی ئایەتی (١٨٧-١٨٩):

١- خوا پەیمانی تۆکمەو مەحکەمی لەزانایانی (بەنی ئیسرائیل) وەرگرت کە: هەرگیز هەق نەشارنەوە، دیارە زانایانی ئەم ئوممەتەش دەبیٚ چاکتر سوور بن بۆ دەرخستنی هەق و ڕاستیی و، تەئویل نەکردنی ئایەتەکان لەبەرخاتری ئەم وئەو.

٢- موسڵمان نابیٚ ڕیٚگا بدا مەدح وسوپاس بکریٚ لە بەرامبەر شتیٚکەوە نەیکردبیٚ، بەڵکو ئەگەر کردبوویشی دەبیٚ بیشاریٚتەوە.

### لە بوونەوەردا نیشانە گەلیٚ هەیە بۆ تاك و تەنیایی خوا:

﴿[١٩٠] إن في خلق السموات والأرض﴾ بەڕاستی لەوشیٚوە دروستکردنە سەرسوڕهیٚنەرەی ئاسمانەکان و زەویی ﴿واختلاف الليل والنهار لآيات لأولي الألباب﴾ و ئاڵوگۆڕی شەوو ڕۆژ، چەندین بەڵگەو نیشانەی پتەو هەیە لەسەر بوونی خواو، تاك و تەنیایی بۆ کەسانیٚ خاوەنی ژیرین و هۆشمەندن ﴿[١٩١] الذين يذكرون الله قياما وقعودا وعلى جنوبهم﴾ ئەوکەسانەی کە بەپیٚوەو بەدانیشتن و لەسەر تەنیشت و ڕاکیٚشان یادی خوا دەکەن ﴿ويتفكرون في خلق السموات والأرض﴾ لەدروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی ڕادەمیٚنن و بیردەکەنەوە ﴿ربنا ماخلقت هذا باطلا﴾ دەڵیٚن: ئەی پەروەردگاری ئیٚمە! هەرگیز تۆ ئەم دروستکراوە پڕ لە وردەکارییەت بیٚهودە و بیٚ ئامانج دروست نەکردووە ﴿سبحانك﴾ تۆ لەهەموو ناتەواوییەك پاك ڕائەگرین ﴿فقنا عذاب النار﴾ دەسا تۆیش لە سزای ئاگر بمانپاریٚزە. لەئایەتی (٢٧)ی سوورەتی (صاد)دا هاتووە: (وما خلقنا السماء والأرض وما بينهما باطلا ذلك ظن الذين كفروا فويل للذين كفروا من النار) کە بیٚ باوەڕان پیٚیان وایە ئەم بوونەوەرە لەخۆیەوەو بیٚهوودە دروستکراوە ﴿[١٩٢] ربنا إنك من تدخل النار فقد اخزيته﴾ پەروەردگارا!.. بیٚگومان هەرکەسیٚ تۆ بیخەیتە ناو ئاگرەوە، ڕیسوات کردووەو، لای گشت مەردم ئابڕووی چووە ﴿وما للظالمين من انصار﴾ و بۆخەڵکانی ستەمکار وبیٚ باوەر هیچ پشتیوانیٚك نییە ﴿[١٩٣] ربنا إننا سمعنا مناديا﴾ پەروەردگاری ئیٚمە! گویٚمان لەجاڕچییەك بوو بانگی دەکرد، واتە: پەیامبەر ﷺ، یان قورئان، هەرچەند (ئیبن کەسیر) دەڵیٚت: ئەو بانگ ڕایەڵە پیٚغەمبەرە ﷺ ﴿ينادي للإيمان﴾ بانگی دەکرد بۆ باوەرهیٚنان ودەیگوت: ﴿أن آمنوا بربكم فآمنا﴾ بە پەروەردگارتان باوەڕ بیٚنن، ئەوسا ئیٚمەیش وەڵاممان دایەوەو بڕوامان هیٚناو شویٚنی کەوتین ﴿ربنا فاغفرلنا ذنوبنا﴾ ئەی پەروەردگاری ئیٚمە! دەسا گوناهەکانمان بپۆشە ﴿وكفر عنا سيئاتنا﴾ و بەمیهرەبانی خۆت لەتاوانە وردەکانمان ببوورە، بیان سڕەوە ﴿وتوفنا مع الأبرار﴾ و لەگەڵ چاکان بمانمریٚنە ﴿[١٩٤] ربنا وآتنا ما وعدتنا على رسلك﴾ پەروەردگاری ئیٚمە! ئەوەمان پیٚ ببەخشە لەسەر زمانی

پەیامبەرانتەوە بەڵێنت پێدابووین ﴿ولا تخزنا یوم القیامة﴾ شەرمەزارو ڕوو زەردی ڕۆژی قیامەتمان مەکە ﴿إنك لا تخلف المیعاد﴾ بەڕاستی تۆ لەپەیماندا لاریت نییەو دەیبەیتە سەر.

**پەروەردگار بە هانای خاوەن دڵانەوە دێت:**

کاتێ کە موسڵمانان بەو شێوەیە پاڕانەوە، پەروەردگاریش وەڵامی دانەوەو دوعاکەیانی گیرا کرد, ئەفەرمووی: ﴿ ١٩٥ فاستجاب لهم ربهم انی لا اضیع عمل عامل منکم من ذکر اوانثی﴾ ئینجا پەروردگاریان وەڵامی دانەوە کە: بەڕاستیی من کاروکردەی هەرکام لەئێوە -نێرو مێتان- زایەو بێ پاداش ناکەم ﴿بعضکم من بعض﴾ هەندێکتان لەهەندێکن, پیاو، لەژنەو، ژنیش لەپیاوەو گشتیشان لای من چونیەکن، کەوابوو لە پاداشتیشدا یەکسانن، لەم ئایەتەدا پلەو یەکسانی ژنان و پیاوان لە پاداش وتۆڵەدا وەك یەك ڕادەگەیەنرا, پاش ئەوەی ژنان هیچ حیسابێکیان بۆ نەدەکرا ! ﴿فالذین هاجروا واخرجوا من دیارهم﴾ جا ئەوکەسانەی هیجرەتیان کردو لەزێدو نیشتمانی خۆیان دەرکران ﴿واوذوا فی سبیلی﴾ و لەڕای مندا ئازار دران ﴿وقاتلوا وقتلوا﴾ و جەنگان لەگەڵ دوژمنانی منداو شەهیدکران ﴿لأکفرن عنهم سیئاتهم﴾ بەتەئکید تاوانەکانیان دەسڕمەوە ﴿ولأدخلنهم جنات تجری من تحتها الأنهار﴾ و دەیانخەمە نێو چەند باخاتێکەوە، کە بە بەر درەختەکانیدا ڕووبارو چۆمەئاو دەچێت ﴿ثوابا من عندالله﴾ ئەوە پاداشتێکە لەلای خوا وەری دەگرن ﴿والله عنده حسن الثواب﴾ لای خواش پاداشتی باش وچاك هەیە, واتە: بەهەشتی ڕازاوەو جوانیان بۆئامادەیە.

الجزء الرابع ‏ سورة آل عمران

فَاسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّي لَا أُضِيعُ عَمَلَ عَامِلٍ مِّنكُم مِّن
ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ بَعْضُكُم مِّن بَعْضٍ فَالَّذِينَ هَاجَرُوا وَأُخْرِجُوا
مِن دِيَارِهِمْ وَأُوذُوا فِي سَبِيلِي وَقَاتَلُوا وَقُتِلُوا لَأُكَفِّرَنَّ
عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ وَلَأُدْخِلَنَّهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا
الْأَنْهَارُ ثَوَابًا مِّنْ عِندِ اللَّهِ وَاللَّهُ عِندَهُ حُسْنُ الثَّوَابِ ﴿١٩٥﴾
لَا يَغُرَّنَّكَ تَقَلُّبُ الَّذِينَ كَفَرُوا فِي الْبِلَادِ ﴿١٩٦﴾ مَتَاعٌ قَلِيلٌ
ثُمَّ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمِهَادُ ﴿١٩٧﴾ لَٰكِنِ الَّذِينَ اتَّقَوْا
رَبَّهُمْ لَهُمْ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا
نُزُلًا مِّنْ عِندِ اللَّهِ وَمَا عِندَ اللَّهِ خَيْرٌ لِّلْأَبْرَارِ ﴿١٩٨﴾ وَإِنَّ مِنْ
أَهْلِ الْكِتَابِ لَمَن يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْكُمْ وَمَا
أُنزِلَ إِلَيْهِمْ خَاشِعِينَ لِلَّهِ لَا يَشْتَرُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ ثَمَنًا
قَلِيلًا أُولَٰئِكَ لَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ إِنَّ اللَّهَ
سَرِيعُ الْحِسَابِ ﴿١٩٩﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اصْبِرُوا
وَصَابِرُوا وَرَابِطُوا وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٢٠٠﴾

ترتيبها ٤ ‏ سُورَةُ النِّسَاءِ ‏ آياتها ١٧٦

٧٦ ‏ يَا أَيُّهَا النَّاسُ

**ڕێنمایەکانی ئایەتی (١٩٠-١٩٥):**

١- بۆ بەهێز بوونی ئیمانو بڕوا, پێویستە لە بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی تێرامانین بکەین.

٢- خوێندنی ئەم ئایەتانەی: (إن فی خلق السموات والأرض..) تاکۆتایی سوورەتەکە، بەتایبەتی لەکاتی هەڵسان بۆ شەو نوێژ سوننەتە، لەبەر ئەو فەرمووده (متفق علیه)یە کە(ئیبن عەباس) دەڵێ: پێغەمبەرﷺ بۆ ماوەیەك لەگەڵ خانەوادەی خۆیدا قسەی دەکردو پاشان تابەشی سێیەمی شەو دەنووست، ئەوسا هەڵدەسا لەئاسمانەکان ورد دەبوویەوەو دەیگوت: (إن فی خلق السموات والأرض...) جا هەڵدەساو دەست نوێژی دەگرت و سیواکی دەکردو, یانزە ڕکات نوێژی دەکرد، ئەوجا (بیلال) بۆبەیانی بانگی گوت، پاشان دوو ڕەکات سوننەتی بەرلە نوێژی بەیانی دەکرد، ئەوجا لەماڵ دەردەهات و بەر نوێژی بۆ دەکردن.

٣- هەمووکات یادی خوا بەپێوە، بە دانشیتن، بەراکشان , لەسەر تەنیشت سوننەتە، وەك خاتوو عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) ئەڵێ: ((انّ النبیَّ کان یَذکُرُ اللهَ فی کل اَحیانهِ))، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشە یادی خوای دەکرد.

٤- داوای پەنادان لەئاگری دۆزەخ بە بڕواو ئاکاری چاك و پاڕانەوە لەخوا سوننەتە.

٥- فەزیلەتی هیجرەت و جیهاد لەبەر خوا.

٦- ژن و پیاو لە پاداش و تۆڵەدا یەکسانن.

٧- هەوڵ بدرێ ژیان لەگەڵ چاکاندا بەرێ بکرێ .

**بەگەڕ و فڕی خوانەناسان چەواشە مەبن:**

جاخوا بۆدڵخۆشی پەیامبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿[١٩٦] لا یغرنك تقلب الذین کفروا فی البلاد﴾ هاتوچۆ و گەڕوفڕی خوانەناس و بێ باوەڕان لە ولاّتان و شاران، تۆ چەواشە نەکاو سەرت لێ تێك نەدات ﴿[١٩٧] متاع قلیل﴾ ئەوە کالاّو گوزەرانێکی کەمەو تەواو دەبێ و دەگەڕێنەوە لای خوا بۆ لێکۆڵینەوە ﴿ثم مأواهم جهنم﴾ پاشان ڕێ و شوێنیان دۆزەخە ﴿وبس المهاد﴾ ئای دۆزەخیش چ لانکێکی خراپە ﴿[١٩٨] لکن الذین اتقوا ربهم لهم جنات تجری من تحتها الأنهار﴾ بەلاّم ئەوکەسانەی لەسنوورەکانی پەروەردگاریان خۆدەپارێزن، چەند باخاتێکیان بۆ هەیە لە بەهەشتدا کە: ئاوو رووبار بەبەریاندا دەڕوا ﴿خالدین فیها﴾ و بە هەتاهەتاییش تیا دەبن ﴿نزلا من عندالله﴾ ئەوە میوانداریەکە لای خوای گەورە، بۆیە ئەوگشت رێزەیان لێدەگرێ ﴿وما عندالله خیر للأبرار﴾ خۆ ئەوەش لای خوایە بۆ پیاوچاکان باشترە.

**خاوەن نامەکانیش باوەڕداریان تێدایە:**

لە(ئەنەس)ـەوە دەگێڕنەوە کاتێ کە (نەجاشیی) مرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((إستغفروا لأخیکم)) داوای لێخۆشبوون بۆبراکەتان (نەجاشی) بکەن، کەچی خەڵکەکە وتیان: سەیرە فەرمانمان پێدەدا، داوای لێخۆشبوون بکەین بۆ کافرو خوانەناسێ کە لەولاّتی حەبەشەدا مردووە؟! ئەوجا ئەم ئایەتە هات و فەرمووی: ﴿[١٩٩] وإن من اهل الکتاب لمن یؤمن بالله وما انزل إلیکم وما انزل إلیهم﴾ بەراستیی لەخاوەننامەکاند واهەیە, باوەڕی بەخوا بەو بەقورئانە بۆئێوە نێردراوەو، بەو کتێبانەیش بۆخۆیان رەوانەکراون هەیە، بۆ نموونە: (عەبدوللّلای کوڕی سەلام) و هاوەڵەکانی و، (نەجاشی) و شوێنکەوتووەکانی باوەڕیان بەوانە هەبوو ﴿خاشعین لله﴾ خاکەڕان لەبەرامبەر خواداو لێیدەترسن و ملکەچی فەرمانەکانی ئەون ﴿لا یشترون بآیات الله ثمنا قلیلا﴾ هەرگیز بەئایەتەکانی خوا بەهایەکی کەم ناکڕن ، هەرچی لەتەورات و ئینجیلییشدا هاتووە نایشارنەوە ﴿اولئك لهم اجرهم عند ربهم﴾ ئا ئەوانە لای پەروەردگاریان مزەو پاداشیان بۆهەیە ﴿إن الله سریع الحساب﴾ بێگومان خوا زۆر زوو بەکارو حیسابدا دەگات ، هیچی لێ ون نابێت، چونکە ئاگای لەهەمووشتێکە ﴿[٢٠٠] یاایها الذین آمنوا اصبروا﴾ ئەی گەلی خاوەن باوەڕ! لەسەر هەر نارەحەتییەك دێتە ڕێتان، خۆراگربن ﴿وصابروا﴾ و لە خۆڕاگریشدا پێشەنگبن، واتە: دەبێ ئێوە ئارامتان لەهەموان زیاتر بێت، بەتایبەتی لەگۆڕەپانی جەنگدا ﴿و رابطوا﴾ وە دەبێ بۆپاراستنی سنورەکانی دەوڵەتی ئیسلامیی، هەمیشە پەیوەست و سازو تەیاربن و، هەمووکات لەسەنگەردا ئامادەبن و دیفاع لەسنوورەکانتان بکەن ﴿واتقوا الله لعلکم تفلحون﴾ و لەخوا بترسن، بەشکو براوەو بەختیاربن. بەڵی ئەم سوورەتە -کە پڕە لەباسی (صبر)و (تەقوا) -ئاماژەیە بەگرنگی ژیانی موجاهید، بەتایبەتی لە گۆڕەپانی جیهاددا.

رێنماییەکانی ئایەتی (١٦٩-٢٠٠):

١- دەبێ موسڵمان هەمیشه وریاو وشیار بێ و، هیچ کات رزق و رۆزی فرەی کافران لەخشتەی نەبا، چونکه شتی وا نیشانەی رەزامەندی خوا نیە، وە ئەو نیعمەت و بەخششانه که خوا بۆ ئاکارچاکان ئامادەیکردوون لەم دنیایەو لەوەیش تێیدایه باشترە.

٢- رێزگەتن لەباوەڕداره خاوەن کتێبەکان و، مژدەی قورئانیش بەبەهشت پێیان ، بەتایبەتی (عەبدولاّی کوڕی سەلام) و (ئەسحەمە)ی (نەجاشیی). لەفەرموودەیەکی(متفق علیه)دا هاتووه: ئەو وەختە کە (نەجاشی) مرد، پێغەمبەر ﷺ هەواڵی مردنەکەی بەهاوەلاّنی گەیاندو، پاشان فەرمووی: ((إنّ أخاكُمْ بالحبشة قد مات، فَصَلُّوا عليه، فَخَرَجَ الى الصحراء، فَصَفَّهُمْ وصَلى عَلَيْه))، واتە: نەجاشی براتان لەحەبەشە مردووە، دەسا نوێژی لەسەر بکەن، پاشان لەماڵ چوویەدەرێ و هاوەلاّنی لەدەشت ڕیز کردوو نوێژی لەسەرکرد. خۆراگرتن و پەیوەستبوون بەسەر سنوورەکانی ئیسلامەوە بۆ بەدەستهێنانی بەختیاریی و سەرکەوتنی دنیاو قیامەت هەمیشه واجیبە. خۆپەیوەست کردن بەسنوورەکانەوە (مورابیتە) بۆ پاراستنیان لەپەلاماری کافران زۆر مەزن و گەورەیە، گەلێ فەرمودەش بۆئەوە هاتووه وەکو: ((رِباطُ يَوْمٍ فِي سبيل الله خَيْرٌ من الدنيا وما فيها)) (بوخاریی)، خۆئامادەکردن و مانەوە لەسەنگەردا بۆپاراستنی رێگای خوا تەنیا رۆژێك لەهەموو دنیا باشترە. یان: (رِباطُ يَوْمٍ خيرٌ مِنْ صيامِ شَهْرٍ وَقِيامِهِ). موسلیم. (ریباط)ی تەنیا رۆژێك لە رۆژوو و شەونوێژی مانگێك چاکترە.

سوپاسی زۆر مەزن بۆ خوای بڵند کە یارمەتیدام بۆ تەواوکردنی ئەم کورتە تەفسیرەی سوورەتی (ئالی عیمران)ە.

و صلى الله وسلم و بارك على قائدنا محمد و آله و صحبه و كل من والاه.

*** *** ***

## ٤- سوورەتی ( نیساء )

## مەدەنییەو ( ١٧٦ ) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتەش یەکێکە لەسوورەتە درێژەکانی قورئان و پڕە لەیاسای جۆراوجۆری شەرعیی، لەوانە: یاسای رێکخستنی کاروباری دەرەوەی موسڵمانان، بایەخیش دەدات بەکاروباری ژنان، بەجۆرێك کەدەتوانین بڵێین تەوەرەکەی هەرباسی کاروباری ژنانە، هەر لەبەر ئەمەیشە بەسوورەتی (النساء ، ژنان) ناوبراوە، ئینجا باسێکی پێکهێنانی خێزانو، دەوڵەتو، مافی هەتیوان دەکات بەتایبەتی کچۆڵە بێ باوکەکان ئەوانەی وا باوکیان نەماوەو لەکۆشی سەرپەرشتی کاردا دەژین. قەدرو حورمەت و، کەرامەت و رێزی ژنان دەپارێزێ و، داوا لەپیاوان ئەکات کە بەدین و ویژدانەوە سەیری کاروباریان بکەن و مافیان بۆدابین بکەن لە: مارەییو میراتو بژێوی رۆژانەو چاك رەفتاریی..هتد. ئەندازەیەکیش بەدرێژە یاسای کەلەپوورو میرات بۆگشت کەسێ دیاریی ئەکات، پاش ئەوەی کە لەجاهیلیەتدا گاڵتە بەمیرات ئەکرا، کەبەراستیی لەم یاسای میراتەدا کە دینی ئیسلام دای هێناوە گەورەترین دادگەریی و یەکسانی بەدی ئەکرێ، هەروەها باسێکی ئەو ژنانەش ئەکات کە بەهۆی رشتەو شیرخواردن و ژن و ژن خواستنەوە حەرام دەبن مارەبکرێن.

پەیوەندیی نێوان ژن ومێرد رێکدەخات و دەشڵێت پەیوەندی نێوان ژن وپیاو تەنها شتێکی جەستەیی و تێرکردنی ئارەزووی جنسیی نییە، بەڵکو پەیوەندییەکی بنەمادارو ئادەمییانەیە، هەروەك باسی ئەوەش دەكا کەمارەیی نرخ و بەهای ژنان نییە، بەڵکو بەخشش و دیارییەکە قورئانی پیرۆز لەسەر پیاو بۆی نوسیون، چونکە مارەیی هۆیە بۆزیادبوونی خۆشەویستیی و، پێکەوە بەستنی دڵەکان. رەچاوکردنی چەند نەخشەو پلانێك بۆراگرتنی پەیوەندیی نێوان ژن ومێرد لەکاتی ئاڵۆزبوونی نێوانیان و هێورکردنەوەی ئاڵۆزییەکە، لەگەڵ دیاریکردنی ئەرك و دەسەڵاتی پیاو بەرامبەر بەژنان، (قەوامە)و دەسەڵاتی پیاوانیش رون دەکاتەوەو دەڵێت: قەوامە مانای بەکۆیلە کردنی ژن بۆپیاوان نییە، بەڵکو قەوامە ئەرك و تەکلیفێکە خراوەتە سەرشانی پیاوان بۆ ژنان.

الجزء الرابع — سورة النساء

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا
زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ
بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١ وَءَاتُواْ ٱلۡيَتَٰمَىٰٓ أَمۡوَٰلَهُمۡۖ
وَلَا تَتَبَدَّلُواْ ٱلۡخَبِيثَ بِٱلطَّيِّبِۖ وَلَا تَأۡكُلُوٓاْ أَمۡوَٰلَهُمۡ إِلَىٰٓ أَمۡوَٰلِكُمۡۚ إِنَّهُۥ
كَانَ حُوبٗا كَبِيرٗا ٢ وَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا تُقۡسِطُواْ فِي ٱلۡيَتَٰمَىٰ فَٱنكِحُواْ
مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ مَثۡنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَۖ فَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا تَعۡدِلُواْ
فَوَٰحِدَةً أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡۚ ذَٰلِكَ أَدۡنَىٰٓ أَلَّا تَعُولُواْ ٣ وَءَاتُواْ
ٱلنِّسَآءَ صَدُقَٰتِهِنَّ نِحۡلَةٗۚ فَإِن طِبۡنَ لَكُمۡ عَن شَيۡءٖ مِّنۡهُ نَفۡسٗا فَكُلُوهُ
هَنِيٓـٔٗا مَّرِيٓـٔٗا ٤ وَلَا تُؤۡتُواْ ٱلسُّفَهَآءَ أَمۡوَٰلَكُمُ ٱلَّتِي جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمۡ
قِيَٰمٗا وَٱرۡزُقُوهُمۡ فِيهَا وَٱكۡسُوهُمۡ وَقُولُواْ لَهُمۡ قَوۡلٗا مَّعۡرُوفٗا ٥ وَٱبۡتَلُواْ
ٱلۡيَتَٰمَىٰ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغُواْ ٱلنِّكَاحَ فَإِنۡ ءَانَسۡتُم مِّنۡهُمۡ رُشۡدٗا فَٱدۡفَعُوٓاْ
إِلَيۡهِمۡ أَمۡوَٰلَهُمۡۖ وَلَا تَأۡكُلُوهَآ إِسۡرَافٗا وَبِدَارًا أَن يَكۡبَرُواْۚ وَمَن كَانَ
غَنِيّٗا فَلۡيَسۡتَعۡفِفۡۖ وَمَن كَانَ فَقِيرٗا فَلۡيَأۡكُلۡ بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ فَإِذَا
دَفَعۡتُمۡ إِلَيۡهِمۡ أَمۡوَٰلَهُمۡ فَأَشۡهِدُواْ عَلَيۡهِمۡۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ حَسِيبٗا ٦

٧٧

لەبازنەی خێزانەوە بۆ بازنەی کۆمەڵگە بەگشتیی ئەگوێزێتەوەو، بەرامبەر هەمووشتێك فەرمان بەچاکە دەداو، روونی دەکاتەوە کەبناغەی چاکە، سۆزو میهرەبانیی و دەستەبەر بوونە بۆیەکتری و ئامۆژگاریی و چاوپۆشیی و لێبوردنە لەیەکترو پاراستنی ئەمانەت و راگرتنی دادگەرییە.. دیارە کۆمەڵگەیەك بەوشێوەیە بنیات بنرێ زۆر بەهێزو بەتین دەبێت. فەرمان ئەدات کە هەمووکات ئامادەبن بۆ پاراستنی ئەمنو ئاسایشی دەرەوە (الأمن الخارجي) و هۆشیاربن لەپیلانی دوژمنان و ژێردەستەیی بۆیان و پێشێلیان نەکەن. هەندێ یاسا دادەنێ بۆ تەعامول کردن لەگەڵ دەوڵەتانی نەیارو ناحەز، وەیان لەگەڵ دەوڵەتانی بێ لایەن و پێیان دەڵێت کە موسڵمانان چۆن لەگەڵ دەوڵەتاندا رەفتاربکەن. پاش فەرمان بەجیهادیش دەداو هێرشێکی توند دەکاتە سەر دووڕووەکان، چونکە ئەوانن میکرۆبی فەسادو گێرەشێوێنی و، مایەی ساردکردنەوەی مەردومن لەجیهاد. موسڵمانان هۆشیار دەکاتەوە لەخاوەن نامەکان، بەتایبەت جوولەکەکان.

لەکۆتاییدا باسی سەرلێشێواوی گاورەکان دەکا سەبارەت بەعیسا کە: ئەوەندە گەورەیان کرد، هەتا پەرستیان و پاشان بەقسەی ئەوان کوژراو هەڵیانواسی، لەگەڵ ئەوەیشدا کە بەخوایان ئەزانی! قورئان بانگیان دەکات کە واز لەو بیروبۆچوونە پووچەیان بێنن و سەرجەم بگەڕێنەوە بۆ یەکتاپەرستیی. هەر لەبەر ئەوهەموو مەسەلە تایبەت مەندانەی ژنانە پێیدەڵێن: (سورەتی گەورەی ژنان) و بەسوورەتی (تەڵاق)یش دەڵێن: سورەتی بچووکی ژنان.

**ترستان لەخوا هەبێ و ، ئاگاشتان لە خزمان بێ:**

خوای جوانکار لەم ئایەتەدا فەرمان بەتەقوا دەداو داوا دەکا کە: تەنها ئەو بپەرستن، بۆیە دەفەرموێ: ﴿بسم الله الرحمن الرحيم * [1] يا أيها الناس اتقوا ربكم﴾ ئەی خەڵکینە! لەو پەروەردگارەتان پەرواتان بێ و بترسن ﴿الذي خلقكم من نفس واحدة﴾ کە ئەو ئێوەی لە تاکە کەسێك (ئادەم) ﷺ دروستکرد ﴿وخلق منها زوجها﴾ و هەرلەو

تاكەكەسەش هاوسەرەكەشی (حەوا) دروستكرد، لەم فەرمووده راست و رەوانەیشدا هاتووەو دەفەرموێ: ((.. فإن المرأةَ خُلِقَتْ من ضِلَعٍ، وإن أعْوَجَ شئْ فى الضِلَعِ اعلاه، فإن ذهَبْتَ تُقيمُهُ كَسَرْتَهُ وإن تركْتَهُ لم يَزَلْ أعوجَ، فاستوصوا بالنساء خيرا)) فتح البارى: ٣٣٣١/٦. واتە: ئافرەت لەپەراسوو دروستكراوە، بێ شك بەشی هەرەلاری پەراسوو، بەشی سەرووییەتی، جائەگەر بتەوێ راستی بكەیتەوە, ئەوا دەیشكێنی، خۆئەگەر وازی لێ بهێنیت ، ئەوا هەر بەلاری دەمێنێتەوە! واتە: دەبێ ئارام و صەبرتان لەگەڵ ژناندا هەبێ و، نابێ لەسەداسەد پێتان وابێت بەئارەزو و بۆچوونی ئێوە كاربكەن، بێگومان هەرگیز ئەوە لەتوانادا نییەو نابێ، هەروەكو (پەراسوو) قەت بەتەواوی راست نابێتەوە ﴿وبث منهما رجالا كثيرا ونساءا﴾ و لەو دووانەیش پیاوانێكی زۆرو، ئافرەتانێكی زۆری بەدنیادا بڵاوكردەوە لەگەڵ جیاوازی رەنگ و زمان و لێهاتوویی و لێوەشاوەییان ﴿واتقوا الله الذى تساء لون به والأرحام﴾ و لەوخوایەی بترسن كە بەناوی ئەو یەكتری سوێند دەدەن و لەیەكتر بەو داوا دەكەن ، بۆنمونە ئەڵێن: لەبەرخوا ئەوكارەم بۆ بكە، ئەو شتەم بدەرێ، وە هەروا خۆشتان لە مافی خزمایەتی بپارێزن و پشت لەیەكتر نەكەن و، هاوكاری یەك بن و، لەكاتی بوون ونەبوون بەدەم یەكەوەبن.﴿إن الله كان عليكم رقيبا﴾ بێگومان خوا بەوردیی و هەمیشەیی ئاگادارو چاودێرە بەسەرتانەوە ، دەزانێ ئەركی سەرشانتان ئەنجام دەدەن، یان نا.

رێنمایی ئەم ئایەتە:

١- فەزڵ و گەورەیی ئەم ئایەتە، بۆیە هەركە پێغەمبەر ﷺ وتاری بۆ هەرشتێك دابا، ئەم ئایەتەو، ئایەتی (ياأيها الذين آمنوا اتقوا الله حق تقاته ولا تموتن إلا وأنتم مسلمون)ی سورەتی(ئالی عیمران) و ئایەتی (ياأيها الذين أمنوا اتقوالله وقولوا قولا سديدا يصلح لكم أعمالكم ويغفر لكم ذنو بكم ومن يطع الله ورسوله فقد فاز فوزا عظيما)ی سوورەتی (ئەحزاب)ی دەخوێندو، پاشان ئەیفەرموو: (أمابعد). ئەوسا باسی مەبەستەكەی دەكردو وتارەكەی دەدا.

٢- گرنگی فەرمان بە تەقوا، بۆیە لێرەیشدا دووجار فەرمانەكە وتراوەتەوە، سەردانی خزمان و لێپرسنەوە لێیان پێویستەو، پێچەوانەكەشی كارێكی حەرامە، ریعایەتی برایەتیی لەنێوان مرۆڤەكانا لەكاتی كڕین و فرۆشتندا كارێكی پێویستە.

**ماڵی هەتیوان بەناهەق مەخۆن:**

﴿[٢] وآتوا اليتامى أموالهم﴾ ماڵ و سامانی هەتیوان - هەركە پێگەیشتن و باڵغبوون- بەرێكوپێكی بدەنەوە ﴿ولا تتبدلوا الخبيث بالطيب﴾ و ناپاك بەپاك مەگۆڕنەوە، واتە: ماڵ و دارایی كەم نرخی خۆتان، بەماڵ وسامانی بەنرخی ئەوان مەگۆڕنەوە ﴿ولا تأكلوا أموالهم إلى اموالكم﴾ و ماڵ و سامانیان تێكەڵ بەماڵی خۆتان مەكەن و، پێكەوە مەیخۆن ﴿إنه كان حوبا كبيرا﴾ بەراستی خواردنی ماڵ و سامانی هەتیو، تاوان و گوناهێكی ئێجگار گەورەیە. ﴿[٣] و إن خفتم الا تقسطوا فى اليتامى﴾ خۆئەگەر ترسان كە بە دادگەرانە نەتوانن رەفتار لەگەڵ كیژە هەتیوەكاندا بكەن ، ئەگەر مارەیان بكەن ﴿فانكحوا ما طاب لكم من النساء مثنى وثلاث ورباع﴾ دەسا ئەوژنانە مارە بكەن پێتان دەشێن، دوان دوان ، سیان سیان، چوار چوار، واتە: هەریەكێكتان دەتوانن هەتا چوار ژن مارە بكەن، بەمەرجی عەدالەت و توانایی ژیاندنیان، بۆیە دەفەرموێ: ﴿فإن خفتم إلا تعدلوا فواحدة﴾ خۆئەر ترسان نەتوانن بەدادگەرانە وەكو یەك تەماشای ژنەكانتان بكەن، دەبێ تەنها ژنێك مارە بكەن ﴿اوما ملكت ايمانكم﴾ وەیان هەر بەو كەنیزانە دەستتان كەوتوون و بوونەتە موڵكتان قەناعەت بكەن ﴿ذلك ادنى الا تعولوا﴾ ئابەوشێوە نزیكترە كە غەدرو ستەم لە ژنان نەكەن. پێشەوا موسلیم دەڵێت: (عوروەی كوڕی زوبەیر) مانای ئایەتی (وإن خفتم..)ی لە خاتوو

عایشەی پووری پرسیی و ئەویش گوتی: خوشکەزاکەم! لەسەردەمی جاهیلییەتدا کچۆڵەی هەتیوو بیٚ باب دەکەوتە لای کەسێك کە سەرپەرستیاری بکا، هەتا گەورە دەبوو، ئەوجا هەرچی هەبوو تێکەڵی ماڵەکەی خۆی دەکرد، پاشان لە بەرماڵەکەی حەزی لێدەکردو، دەیویست بەمارەیەکی کەمتر لە ژنانی تر مارەی بکاو بەشووی بدات، جا بۆ راستکردنەوەی ئەوهەڵەیەو، لابردنی ئەوستەمە لەژنان، خوا ریٚی لێگرتن و فەرمووی: یائەوەیە کەمارەیی شیاوی خۆیانیان بدەنیٚ، ئەوسا مارەیان بکەن، وەیان بچن ژنانی تر مارەبکەن. بەڵیٚ.. گومان نییە کە لەپێش دینی ئیسلامدا، بیٚ یاساو دیاریکردنی هیچ جۆرە سنوورێك ژنانێکی زۆریان مارە دەکرد و تێکەڵ دەبوون لەگەڵیاندا، تەنانەتی تا سەد ژنیان حەلاڵکردبوو بۆخۆیان، بەڵام کاتیٚ کەئیسلام هات زۆر بە وردبینانە سنوورێکی بۆ ئەوکارە دیاریکردو لای سەرووی بەچوار ژن دانا. ئەویش لەگەڵ پێش چاو گرتنی چەند مەرجێك، لەوانە:

یەکەم: نابیٚ زیاد لە چوار ژن مارە بکرێت.

دووەم: نابیٚ مافی هیچکامێکیان پێشێل بکریٚ.

سێیەم: دەبیٚ ئەو پیاوە وەك خەڵکانی هاوشانی خۆی بتوانیٚ بیانژێنیٚو دارا بیٚ و، لە هەموو رویەکەوە تێریان بکات.

جا هەر لەم سۆنگەیەوە زاناکان بەکۆی دەنگ بڕیاریان داوە کە: هەرکەسێك خۆی دڵنیابێت کەناتوانیٚ دادگەر بێت لەگەڵ ژنەکەیدا، بۆ ئەوحەرام و یاساغە تەنها ژنێکیش مارە بکات, ئیتر چ جای دوان یان سییان، یان چوار. دیارە ئەم بوون و نەبوون و دادگەریی لای مێرد ، مەسەلەیەکەو پەیوەندی بەئایینو دینەوەیە، واتە: هەر تەنها ئایین بۆی هەیە بڕیاری تێدا بدا، نەك داوەرو دادگا، چونکە ئەو بڕیارە شتێکی نهێنی و دەروونییە، هەرمەگەر تەنها ئایین چارەسەری بکات، دیسانەوە نەفەقەو تفاقیش شتێکی رێژەییە، کەسێك بۆکەسێکی تر جیاوازەو هەواڵەی دەسەلات و توانای ئەوکەسە خۆی دەکریٚ، بۆیە لەقیامەتیشدا هەرکەسە بە پێی خۆی بەرپرسی ئەوکارە دەبیٚ و پرسیاری لێدەکرێت: ئاخۆ وەك پێویست خزمەتی هاوسەرەکەی خۆی کردووە، یان نا؟ لەولایشەوە ستەمو ناهەقییو چرووکی پەیوەندییان بەئاییندەو داهاتووەوە هەیەو، زۆرێکی زۆرینەی خەڵك پاشمارەکردن ئەنجامیان دەردەکەوێت ، شەریعەتیش لەسەر ئەگەرو ئیحتیمال کاروباری پاشەرۆژ بڕیار نادات. چونکە لەوانەیە کەسێك ئێستا دادگەر نەبیٚ، وەیان ئیمکانیەتی ماددی نەبێت، بەڵام دەگونجیٚ پاش رۆژێکی دیکە، پێچەوانەی ئەوە بێت. لەگەڵ ئەوەیشدا دینی ئیسلام بڕیاری داوە: کە ئەگەر کەسێك ستەم لەژنەکەی بکات، وەیان لەتەکیا دەست گوشراوو چرووك بێت، ئەوە لەحاڵەتی ئاوادا، ژنەکە مافی جیابوونەوەی بۆهەیە، خۆئەگەر ژنێك بەئارەزوو پێخۆشبوونی خۆی مێرد بەوجۆرە کەسانە بکا، رێی لێناگیردریٚ و، عەقدەکەشی دادەمەزریٚ، من پێم وایە ئەوکەسانەی کە نەنان و ئاویان هەیەو، نەمەسکەن، وە نە بیانوویەکی شەرعیی، سەرەرای ئەمانەش مناڵەکانیشیان رەش و رووت و کونە گورگێکیشی نییە، تێیدا دانیشن، کەچی هێشتا دەچن ژنی دووەم، یان سێیەم، یان چوارەم مارە دەکەن، ئەوە پێویستە هەرگیز ریٚ بەوجۆرە نیکاحانە نەدرێت، واتە: فرەژنیی "وەکو لە دەقەکانەوە وەردەگیرێت " دەبیٚ بۆکاتی زەرورەت و ناچاریی و پێویست بەکار بهێنرێت، بۆنمونە: ئەوانەی وا مناڵیان نابێت، ئەوانە کە ژنەکانیان نەخۆشن و بە کەڵکی تێکەڵی ژنو مێردی نایەن، وە یان تووشی (برودەی جنسی) بوون و کەمتر خۆیان دەدەن بەدەستەوەو ئارەزووی جنسی پیاوەکەیان تێر ناکەن.. ئەوانە بە قەناعەتی من رێیان پیٚ بدریٚ و یارمەتیش بدرێن بۆ ئەنجامدانی کارەکەیان، دیارە ئەمیش لەگەڵ پێش چاوگرتنی (عەدل) و (ئینفاق)دا، بەڵام

ئەوانەی بیانوویەکی شەرعییان نییەو، دەچن سواری داخوازیی و ئارەزووی خۆیان دەبن و، لەهەمانکاتیشدا فەقیرو هەژارن و ئەوژنانەش دەسخەرە دەکەن، ئەوە لەحاڵەتی ئاوادا دەبێ ڕێیان لێبگیردرێ. بەتایبەت پاش دەرکەوتنی ئەوهەموو گیروگرفت و کێشانە کەئەمڕۆ لە فرەژنییەوە ڕوو دەدەن. هەزار ڕەحمەت لەبەرێزان (موحەممەد عەبدە) و (سەید قوتب) کە بەلایانەوە فرەژنی بۆئەو هەلومەرجانەیە لەسەرەوە باسکران، بۆیە سەبارەت بە فرەژنی دەڵێن: (حالة ضرورية، ولغلبة سوء معاملة الرجال لزوجاتهم عند التعدد، وحرمانهن من حقوقهن في النفقة والراحة، وانتشار الفساد و العداوة بين أولاد الضرائر.. لهذا كله يجوز للحاكم الإسلامي أو لصاحب الدين، أن يمنع تعدد الزوجات صيانة للبيوت عن الفساد) بەڵێ.. دەتوانرێ ئەم ڕاوبۆچوونە بۆهەندێ کات، وەیان بۆ هەندێ کەس بەتایبەت کاری پێ بکرێ و، ڕێیان پێنەدرێ پتر لەژنێك مارە بکەن. (سەید قوتب) دەڵێت: فرەژنی مۆڵەتێکە بۆ دەسەبەرکردنی ئەوسپاردە گەورەیە، بەڵام دەبێ لەوەخت و دەرفەتی خۆیدا بێت، هەروەك تەڵاق شتێکی زەروریی وناچارییە.

**دەبێ مارەیی بە ژنان بدەن:**

﴿[٤] وآتوا النساء صدقاتهن نحلة﴾ وەك پێشکەشیەك دەبێ مارەیی ژنان بدەن و، بە فەرزێکی خوایشی بزانن، واتە: مارەیی ژنان بڕیاری خوایەو فەرزەو، مافی خۆیانەو، کەسێك بۆی نییە ڕێی لێبگرێ ﴿فإن طبن لكم عن شئ منه نفسا﴾ جائەگەر بە پێخۆشبوونی خۆیان، شتێکیان لەمارەیەکەیان پێبەخشین ﴿فكلوه هنيئا مريئا﴾ ئەوحەلە ئێوەش بیخۆن و نۆشی گیانتانی بکەن .

**ڕێنماییەکانی ئایەتی (٢-٤):**

١- هەموو ماڵێکی حەرام ناپاك و پیسە.

٢- هەموو ماڵێکی حەڵاڵ پاکوخاوێنە.

٣- ماڵی چاکی هەتیو نابێ بە ماڵێکی خراپ بگۆڕدرێ.

٤- (وەصیی)و چاودێری هەتیو. نابێ ماڵی هەتیوەکە لەگەڵ ماڵی خۆی تێکەڵ بکاو بیخوا.

٥- زیاد لە ژنێك تا چوار -لەگەڵ ڕەچاو کردنی دادگەری و نەفەقەدا- حەڵاڵە.

٦- خوا مارەیی دانا بۆ ژنان چونکە عەرەب پێش ئیسلام مارەییان بۆ ژنان دانەدەنا، بۆیە دانانی مارەیی بۆ ژنان پێویستە لە سەر پیاوو نابێ هیچ شتێك لەمارەیی ژنان بخورێ ، مەگەر بەرەزامەندی خۆیان .

**ماڵ مەدەنە دەستی کەم ئاوەز:**

خوای دلۆڤان ڕێ بەمرۆڤی کەم ئاوەزو نەزان و شێت نادات کە: سامان ودارایی بدرێتە لایان و بەئارەزووی خۆیان خەرجی بکەن، بۆیە دەفەرموێ: ﴿[٥] ولا تؤتوا السفهاء أموالكم﴾ ماڵ و سامانی خۆتان مەدەنە دەستی جاحێڵ و نەزان خەرجەکان، ئەو هەتیوانەش کەهێشتا پێنەگەیشتوون و نەزان خەرجن، ئەر سامانێکیان هەبێ، لای خۆتان ڕایگرن و مەیدەنەدەستیان ﴿التى جعل الله لكم قياما﴾ کە خوا کردوویە هۆی نەش ونماو ژیان و گوزەرانتان، واتە: ماڵ وسامان کە هۆی گوزەران و ژیانتانە، بەفیڕۆ دایمەنێن و مەیکەنە دەستی مناڵە هەتیوو بێ باب و بێ سەرپەرست ﴿وارزقوهم فيها واكسوهم﴾ و ڕزق و ڕۆزیی و جلوبەرگیان بەپێی باوی ناو موسڵمانان لەو ماڵە بۆدابین بکەن ﴿و قولوا لهم قولا معروفا﴾ و بەقسەی پەسەندو دڵ خۆشکەر لەگەڵیان بدوێن و بڵێن: وانەزانن

ئێمە سامانەکەتان دەخۆین! نەخێر، بەڵکو هەرکات ئێوە گەورەبوون و پێگەیشتن، ماڵ ماڵی خۆتانە، لەم ئایەتەوە شەریعەتی ئیسلام یاسای (حیجر) و قەدەغەکردنی سەرف و خەرجی ماڵ و دارایی داهێنا، جا دەبێ ئەوانە کە منداڵن، یان شێتن، وە یان جاهیل و نەزان خەرجن، ماڵەکەیان لێبسەندرێ و، بدرێتە دەستی (وەصیی) و چاودێریان، یان هەتا حاڵیان چاك دەبێت، لەدادگا بۆیان بپارێزرێ، بەڵام دەبێ بۆ ئەوماوە خواردن و جل و بەرگیان بۆدابین بکرێت ﴿٦ وابتلوا اليتامى حتى إذا بلغوا النكاح﴾ هەتیوان بخەنە ژێر تاقیکردنەوەوە، هەتا ئەگەنە تەمەنی بلووغ بوون و ژن خواستن و توانای ژن ومێردی، واتە: بەجارێ ماڵەکە گشت مەکەنەوە مشتیان، بەڵکو بەیناوبەین شتێکیان بدەنێ و چاودێریان بن: ئاخۆ ئەزانن خەرجی بکەن؟ ﴿فإن آنستم منهم رشدا﴾ ئینجا ئەر دیتان بە فام و ژیرن و خاس‌و خراپ لەیەك دەکەنەوە ﴿فادفعوا إليهم أموالهم﴾ ئەوسا ئێوەیش بێ دواکەوتن پارەو سامانەکەیان بدەنەوە، منداڵ هەرکە پێگەیشت و بلووغ بوو، بەوە لەهەتیویی دەردەچێ و، دەچێتە تۆناغێکی ترەوە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((لايُتمَ بعدَ احتلامٍ، ولا صُماتَ يومٍ إلى الليل)) ئەبووداود.

**بە پێی ماندوبوون لەگەڵ هەتیودا نان بخۆن:**

﴿ولا تأكلوها إسرافا وبدارا أن يكبروا﴾ بەرلەوە هەتیوەکان گەورەببن، ئێوە ئەی چاودێرانی هەتیوان! بە زێدەڕەویی‌و بەپەلە ماڵەکەیان مەخۆن ﴿ومن كان غنيا فليستعفف﴾ ئەوی دەوڵەمەندو دەسەڵاتدار بێت، دەبێ خۆبپارێزێ و هیچ شتێك لەوسامانە وەرنەگرێ بۆخۆی، تەنانەتی بۆچاودێریشیان کرێیی نەوێت ﴿ومن كان فقيرا فليأكل بالمعروف﴾ کێش هەژارو نەدارە، دەتوانێ بەپێی پێویستی ژیانیی خۆی، بەپێی باوی ڕۆژ لێی بخوات، پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: ((كُلْ من مالِ يَتيمِكَ غيرَ مُسْرِفٍ ولامُبَذِّرٍ ولا متأثل مالا، ومن غير أن تَقِيَ مالَكَ..)) ﴿فإذا دفعتم إليهم أموالهم﴾ هەرکاتێکیش بلووغ بوون و ، ویستتان ماڵ و سامانەکە بدەنەوە دەستیان ئەی چاودێران! ﴿فأشهدوا عليهم﴾ دەبێ شایەتیان لەسەربگرن، هەتا بۆدوایی کێشەو هەرا نەنێنەوە ﴿وكفى بالله حسيبا﴾ خۆ هەرخواش بۆچاودێریی و لێپرسینەوە بەسە، ئەگەر ڕەفتاری ڕێك وپێك نەکەن تۆڵەتان لێ ئەسێنێ.

پێش هاتنی دینی ئیسلام عەرەبەکان میراتیان بە ژن و منداڵ نەدەدا.. بەڵام کە قورئان هات بەشە میراتی بۆ هەموان داناو فەرمووی: ﴿٧ للرجال نصيب مما ترك الوالدان والأقربون﴾ لەوکەلەپوورەی لەدوای باوك و دایك و خزمانی نزیك ، جێدەمێنێ، نێرینە بەشی خۆی هەیە ﴿وللنساء نصيب مما ترك الوالدان والأقربون﴾ و هەروا لەو میراتەش لە باوك و دایك و خزمانی نزیك بەجێ دەمێنیت ، مێینەش بەشی خۆی هەیە، هەرچەندە لە بەشەکاندا جیاوازی و فەرق و تەفاوت هەبێ ﴿مما قل منه أو كثر﴾ ئەو میراتە کەم بێت، یان زۆر ﴿نصيبا مفروضا﴾ بەشی هەرکەسێك لەلایەن پەروەردگارەوە دیاریکراوەو براوەتەوەو دەبێ بیدرێتێ، جا ئەندازەو ڕێژەی ئەم بەشەیە لەم ئایەتەدا دیاریی نەکراوە، بەڵام هەر لەم ئایەتانەی سوورەتی (نیساء)دا کە دەفەرموێ: (يوصيكم الله في أولادكم..) وە لەئایەتی (١٧٦)دا کە دەفەرموێ: (يستفتونك قل الله يفتيكم في الكلالة) ئەو ڕێژەیە ڕوونکراوەتەوە.

**کەسانی بێ بەش لە میرات، دەبێ بەشدار بکرێن:**

﴿٨ وإذا حضر القسمة أولوا القربى واليتامى والمساكين فارزقوهم منه﴾ هەرکە لەکاتی دابەشکردنی کەلەپوورەکەدا خزمانی نزیکی مردوو و میرات نەگر، وە هەتیوان و بێ نەوایان لەوێ بوون، دەبێ لەومیراتە شتێکیان بدەنێ و بێ بەشیان نەکەن، هەرچەند میراتیشیان نەکەوێ ﴿وقولوا لهم قولا معروفا﴾ وە بەڕووی خۆش‌و جوانەوە قسەیان لەگەڵ بکەن، با ڕەنجە دڵ نەبن و لێتان نەتۆرێن.

**ستەم لە منداڵان مەکەن:**

﴿٩ و ليخش الذين لو تركوا من خلفهم ذرية ضعافا خافوا عليهم﴾ ئەوکەسانەش کە لەپاش خۆیان چەند وەچەو منداڵێکی بێ دەسەڵاتو لاواز بەجێ دێڵن ، دەبا لەکاتی وەسیەتکردندا ترسی خوایان لەدڵدا بێ و، شتێکی وا لەپاش خۆیان ڕانەسپێرن ناهەقیی وستەم بێ، واتە: جۆرە وەسیەتێ نەکەن، زیان بەژیان و ژیواری خێزانە جێماوەکەی بگەیەنێ و، بەوهۆیەوە لات و کەلەلا بکەون، (سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص) نەخۆش بوو و ویستی دووبەشیی ماڵەکەی بکاتە خێرو صەدەقە، جێی ئاماژە پێکردنە تەنیا کیژۆڵەیەکیشی هەبوو، ئەوجا پێغەمبەر ﷺ ڕێی لێگرت و نەیهێشت، ویستی نیوەی ببەخشێ، هەر ڕێی نەدا، کردیە سێیەك، ئینجا ڕێگەی داو، فەرموویشی هێمان سێیەکیش زۆرە، جا بۆدوایی فەرمووی: ((إنك اَنْ تَذَرَ وَرَثَتَكَ اَغنياءَ خَيْر مِنْ اَنْ تَذَرَهُمْ عالة يتكففون الناس)) فتح الباری. واتە: پاش خۆت میراتبەرەکان بەتێروتەسەل بەجێ بێڵیت باشترە، هەتا بکەونە دەسگرتنەوە لای مەردم ﴿فليتقوا الله وليقولوا قولا سديدا﴾ دەبا لەخوا بترسن و هەمیشە بەرامبەر بەمافەکانیان قسەی باش و پەسەند بکەن.

**هەڕەشە لە ماڵخۆرانی هەتیو:**

﴿١٠ إن الذين يأكلون أموال اليتامى ظلما﴾ ئەوکەسانەی کە بەستەم و ناهەق، ماڵو سامانی منداڵانی هەتیوو بێ باب دەخۆن ﴿إنما يأكلون فى بطونهم نارا﴾ بێ سۆ تەنها ئاگر دەکەنە سك و ورگیانەوە، پێغەمبەریش ﷺ خواردنی ماڵی هەتیوی بەیەکێ لە گوناحە گەورەکان ئەژماردووە. (فتح الباری) ﴿وسيصلون سعيرا﴾ و بەزوویش دەخرێنە ناوئاگرێکی زۆر گەرم و بەگڕی دۆزەخەوە.

الجزء الرابع — سورة النساء

لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ
مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ مِمَّا قَلَّ مِنْهُ أَوْ كَثُرَ نَصِيبًا
مَّفْرُوضًا ﴿٧﴾ وَإِذَا حَضَرَ ٱلْقِسْمَةَ أُو۟لُوا۟ ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ
وَٱلْمَسَٰكِينُ فَٱرْزُقُوهُم مِّنْهُ وَقُولُوا۟ لَهُمْ قَوْلًا مَّعْرُوفًا
﴿٨﴾ وَلْيَخْشَ ٱلَّذِينَ لَوْ تَرَكُوا۟ مِنْ خَلْفِهِمْ ذُرِّيَّةً ضِعَٰفًا
خَافُوا۟ عَلَيْهِمْ فَلْيَتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَلْيَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٩﴾
إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَٰلَ ٱلْيَتَٰمَىٰ ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِى
بُطُونِهِمْ نَارًا ۖ وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا ﴿١٠﴾ يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ
فِىٓ أَوْلَٰدِكُمْ ۖ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ ۚ فَإِن كُنَّ نِسَآءً
فَوْقَ ٱثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ ۖ وَإِن كَانَتْ وَٰحِدَةً فَلَهَا
ٱلنِّصْفُ ۚ وَلِأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا ٱلسُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن
كَانَ لَهُۥ وَلَدٌ ۚ فَإِن لَّمْ يَكُن لَّهُۥ وَلَدٌ وَوَرِثَهُۥٓ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ ٱلثُّلُثُ ۚ
فَإِن كَانَ لَهُۥٓ إِخْوَةٌ فَلِأُمِّهِ ٱلسُّدُسُ ۚ مِنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِى
بِهَآ أَوْ دَيْنٍ ۗ ءَابَآؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ لَا تَدْرُونَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ لَكُمْ
نَفْعًا ۚ فَرِيضَةً مِّنَ ٱللَّهِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١١﴾

٧٨ — وَلَكُمْ نِصْفُ

**ڕێنماییەکانی ئایەتی (٧-١٠):**

١- دانانی یاسای میرات لەئایینی ئیسلامدا، جا هەرکەسێك لەخزمان و هەتیوان و بێنەوایان ، ئەوانەی میرات نابەن، لەکاتی دابەشکردنی میراتەکەدا لەوێ بوون، دەبێ شتێکیان بدرێتێ، خۆئەگەر بەشیان نەدرا دەبا بەقسەیەکی خۆش بەڕێ بکرێن وهەولی ڕازی بوونیان بدرێ.

٢- ئامۆژگاری ئەو کەسە بکرێت لە گیانەڵڵادایە کە: لە وەسیەتەکەیدا ناهەقیی لەمنداڵەکانی نەکا.

٣- دەبێ زۆر بەچاوی سۆزەوە چاودێری هەتیوان بکرێ، خواردنی ماڵی هەتیو بەناهەقو ستەم، هەڕەشەی سەخت هەیە بەرامبەریی و بەگوناهی گەورەش دانراوە، دیاریکردنی بەشێك لەمیرات بۆ ئەوخزمانە میراتیان پێنابڕێت، لەئایەتی (١٨٠)ی سوورەتی (بەقەرە)یشدا باسکراوەو ئەندازەیەك درێژەی پێدراوە، پێشەوا (بوخاریی) لە(ئیبن عەباس)ـەوە دەڵێت: ئەم ئایەتەی (٨)ی سوورەتی (نیسا ﷺ) نەسڕاوەتەوەو کاری پێدەکرێ ، (ئیبن

جەریر)یش هەروا دەڵێت، غەیری ئەمانیش زانایەکی زۆر هەمان راو بۆچوونیان هەیەو دەڵێن: ئەوانە بەشە میرات نابەن، دەبێ شتێکیان بۆ دیاری بکرێت.

**ئایەتی میرات و ، میراتگران:**

لەسەردەمی نەفامییدا منداڵ و ژن میراتیان نەدەدرایە! ئەیانوت: ماڵو سامان بۆکەسێك دەبێ بتوانێ سواری وڵاخ ببێ‌و، شیر هەڵبگرێ‌و بتوانێ، لەگەڵ دوژمن جەنگ بکا، ئینجا خوای دلۆڤان فەرمووی: ﴿[١١] یوصیکم الله فی اولادکم﴾ ئاگاداربن! خوا سەبارەت بەکاروباری منداڵەکانتان وەسیەتتان بۆ ئەکاو پێتان رائەگەیەنێ ﴿للذکر مثل حظ الأنثیین﴾ کە دەبێ لە کەلەپوورتاندا دووئەوەندەی بەشی مێینە، بدەنە نێرینە، واتە: نێرینە دووبەش‌و مێینە نیوەی ئەو. لەم ئایەتەدا هۆی جیاوازیی ئەوبەشانەی دیاریی نەکردووە، بەڵام لەهەمان سوورەتدا ئایەتی (٣٤) دەڵێ: (الرجال قوامون علی النساء بما فضل الله بعضهم علی بعض وبما أنفقوا من أموالهم) هۆکەی دیارییکردووەو لەبەرئەوەیە کە گەلێ ئەرکی ماڵ و منداڵ و، گەلێ جموجوڵ دەکەوێتە سەر پیاوان و، هیچ لەوانە ناکەوێتە سەرژنان، بۆنموونە: ژیان و بژێوی گش ماڵ ومنداڵ، لەسەر پیاوانە، تەنانەتی ژنان کە پێدەگەن و بلووغ دەبن و، هەتا مێردیش دەکەن، نەفەقەیان لەسەر پیاوانە، هەر درانە لای مێردیش، دەبێ مارەییان بۆدیاریی بکرێ و، مێردەکەشی وەکو خەڵکانی هاوشانی خۆی بەباشی بییان ژێنێت، ئەگینا دەتوانێ داوای جیابوونەوەی لێبکات ﴿فإن کن نساء فوق اثنتین﴾ خۆئەگەر ئافرەتە میراتگرەکان دوان بوون، یان زیاتر ﴿فلهن ثلثا ما ترک﴾ دووبەش لەسێبەشی میراتەکە دەبەن ﴿وإن کانت واحدة فلها النصف﴾ خۆئەر مێینەکە تەنها کچێك بوو، نیوەی میراتەکە بۆئەوە ﴿ولأبویه لکل واحد منهما السدس﴾ شەش یەکیش دەدرێ بە هەریەکە لەباوك و دایکی مردووەکە ﴿مما ترک إن کان له ولد﴾ لەو کەلەپوورەی بەجێی هێشتووە، بە مەرجێ مردووەکە منداڵی لەپاش بەجێمابێ، ئیتر چ نێرینە بێت، چ مێینە ﴿فإن لم یکن له ولد﴾ ئینجا ئەگەر هیچ منداڵی نەبوو ﴿وورثه ابواه﴾ و دەبوو باوك و دایکی میراتەکەی بگرن ﴿فلامه الثلث﴾ سێیەکی بۆدایکی دەبێت ﴿فإن کان له إخوة فلأمه السدس﴾ ئینجا هەروەك باوك ودایکی هەیە، ئەگەر چەند برایەکیشی هەبوو، دووان، یان زیاتر، ئەوە لەوحاڵەتەدا دایك شەش یەکی پێدەدرێ و، ئەوی تریشی دەمێنێتەوە بۆ باوکەکە، چونکە ئازووقەو نەفەقە و هەموو پێداویستیەکانی ژنان لەسەر پیاوانن ﴿من بعد وصیة یوصی بها أودین﴾ مافی میراتبەرەکان دوای دانەوەی قەرزو قوڵەو پێکهێنانی وەسیەتی مردووەکە دەدرێ ﴿آباؤکم وابناؤکم لا تدرون أیهم أقرب لکم نفعا﴾ ئێوە نازانن لەباوانتان و نەوەو کوڕەکانتان کامیان سوودی زیاترە بۆتان ، کەوابوو شوێنی یاسای جاهیلییەت ونەفامیی مەکەون: کە بەشی منداڵ و ژنانیان نەئەدا ﴿فریضة من الله﴾ بریارێکە خوا خۆی دیارییکردووە بۆتان، نابێ هیچ کەسێ دەستکاریی بکات ، کەوا بوو ئێوەیش ئابەوشێوەیە میراتەکە دابەش بکەن ﴿إن الله کان علیما حکیما﴾ بێگومان خوا هەمیشە زانایە بەوەی چاکە بۆ میراتبەرەکان و، کار بەجێشە، هیچ کارێکی بێ هوودە نییە.

**میراتی ژن و مێرد:**

﴿[١٢] و لکم نصف ما ترک أزواجکم إن لم یکن لهن ولد﴾ لەو میراتە ژنانتان بەجێی دەهێڵن ئەگەر منداڵیان نەبێ، کوڕ، یان کچ، لە دووبەش بەشێکتان هەیە ﴿فإن کان لهن ولد فلکم الربع مما ترکن﴾ ئەگەر مناڵیشیان هەبوو، ئێوە (ئەی مێردەکان) چواریەکتان ئەکەوێ لەو کەلەپوورەی ئەو ژنانەتان بەجێیان هێشتووە، ئەوی تریشی بۆ میرات بەرەکانی تر ئەبێت ﴿من بعد وصیة یوصین بها او دین﴾ ئەمانەش دوای ئەنجامدانی وەسیەتێك کردوویانە، یان

دانەوەی قەرزو قۆڵەیەك لەسەریانە ﴿و لهن الربع مماترکتم﴾ ژنەکانتان چواریەکی میراتتان دەگرن ﴿إن لم یکن لکم ولد﴾ بەمەرجێ منداڵتان نەبێ، جائەگەر تەنها یەك ژنتان هەبوو، هەموو چواریەکە بۆئەو ئەبێت، خۆئەگەر لەژنێك زیاتر بوون، ئەوا بەیەکسانی دابەش ئەکرێ لەنێوانیاندا ﴿فإن کان لکم ولد﴾ خۆئەگەر مناڵیشتان هەبوو ﴿فلهن الثمن مما ترکتم﴾ ژنانتان هەشت یەکی میراتەکەیان پێدەبرێ ﴿من بعد وصیه توصون بها او دین﴾ پاش دانەوەی قەرزێك لەسەرتانە، یان پێکهێنانی وەسیەتێك کردووتانە ﴿وإن کان رجل یورث کلالة أوامرأة﴾ خۆئەگەر پیاوێك، یا ئافرەتێك مردو (باوك و باپیرو منداڵی نەبوو) ﴿و له اخ او اخت﴾ بەڵکو برایەك یا خوشکێکی دایکی هەبوو، چونکە ئەگەر خوشکی دایکی نەبن میراتەکەی جۆرێکی ترە ﴿فلکل واحد منهما السدس﴾ هەریەکەیان شەش یەکی میراتەکەی بۆهەیە "بێ جیاوازیی لەنێوان نێرو مێ دا" ﴿فإن کانوا اکثر من ذلك﴾ ئەگەر براو خوشکە دایکییەکان لەیەکێك زیاتر بوون ﴿فهم شرکاء فی الثلث﴾ هەموویان سێیەکی کەلەپورەکە دەبەن نێرو مێیان بەیەکسانی ﴿من بعد وصیة یوصی بها أودین﴾ ئەو میراتگرتنەیش دوای پێکهێنانی وەسیەتێك کراوە، یان لەدوای قەرزێ: لەسەریەتی ﴿غیر مضار﴾ نابێ وەسیەتەکە بەجۆرێك بێ زیانبەخش بێت بە کەلەپوورگرەکان ﴿وصیة من الله﴾ ئەم بریارە لە خوداوە دراوە ، کەوابوو ئێوەش گرنگی پێبدەن ﴿والله علیم حلیم﴾ ئەو خوایە، ئەو بریارەی داوە بۆخۆی ئەزانێ چ شتێ چاکە، ئاگادارو لەسەرخۆیە، بۆیە لەسەرپێچیکاران پەلە ناکا تۆڵەیان لێبسێنێت.



۞ وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَٰجُكُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٌ ۚ فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْنَ ۚ مِنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِينَ بِهَآ أَوْ دَيْنٍ ۚ وَلَهُنَّ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّكُمْ وَلَدٌ ۚ فَإِن كَانَ لَكُمْ وَلَدٌ فَلَهُنَّ ٱلثُّمُنُ مِمَّا تَرَكْتُم ۚ مِّنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ تُوصُونَ بِهَآ أَوْ دَيْنٍ ۗ وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَٰلَةً أَوِ ٱمْرَأَةٌ وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا ٱلسُّدُسُ ۚ فَإِن كَانُوٓا۟ أَكْثَرَ مِن ذَٰلِكَ فَهُمْ شُرَكَآءُ فِى ٱلثُّلُثِ ۚ مِنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصَىٰ بِهَآ أَوْ دَيْنٍ غَيْرَ مُضَآرٍّ ۚ وَصِيَّةً مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَلِيمٌ ﴿١٢﴾ تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ ۚ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ يُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ وَذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٣﴾ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُۥ يُدْخِلْهُ نَارًا خَٰلِدًا فِيهَا وَلَهُۥ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿١٤﴾



**لێرەدا پرسیارێك دەکرێ:** بۆچی لەمیراتدا ژنان وەك پیاوان حسابیان بۆناکرێ؟ لەکاتێکدا ژن لاوازترو موتاج ترە بە دارایی؟! جا بۆئەمە وەڵامێکی کورت ئەدەینەوەو دەڵێین: ئیسلام بەپێی تەکلیف وئەرکی سەرشانی مرۆڤەکان ئەومیراتەی داناوە، گومانیش نییە لەوەدا کەپیاوان خەرج و ئەرکی سەرشانیان زۆرترو گەورەترەو، پابەندبوونی داراییشیان زیاترە، چوون لە ئیسلامدا تەنها پیاو داوای بژێویی‌و ژیانی ژن ومنداڵی لێدەکرێ، هەرپیاو مارەیی وەك فەرزێکی خوایی پێشکەش بەژن دەکا. دابینکردنی خان‌و بەرەو جلوبەرگ و خواردن و خۆراك وپێداویستییەکانی تر، ئەمانە هەرهەموو لەسەرشانی پیاوە، خۆهەڵگرتنی ئەو تەکلیفەش لەلایەن پیاوەوە، بێ رێزی و کەمقەدریی ژنان نییە وەك دەڵێن! بەڵکو سروشتی ئادەمزاد کە یاسای کۆمەڵگەی لەسەر بنیات نراوە وایە کە ئافرەت خانمی ناوماڵ بێ وسەرپەرشتی منداڵ بکاو نەبرێتە بەرئەوخۆرە گەرمەی عەرەبستان و ئەفریقیاو دەشتی شارەزوور و بیتوێن، نابێ پاچەکۆڵەو دروێنەو گێرەو کێشەو هەرئیشێکی تر لەگەڵ سروشتیدا نەگونجێت، پێی بکرێ، ئیش‌و کارەکانی دەرەوەی ماڵیش بدرێ بەسەرشانی پیاواندا "کە بەراستیی ئەگەر سەیرێکی وردیی یاسای فسیۆلۆجیای هەردوولا بکرێ، بەباشی

دەرئەکەوێ کە ئەو دابەشکرنە بەوشێوەیە پڕ بەبالآی هەردووکیانە ئیش و کاری دەرەوەی مالّ کە بێگومان ئەوکاتەو ئێستایش لە (٩٥٪)ی هەر ئاوا قورس و سەخت بووە، ئاشکرایشە تەواوی ژنانی جیهان نابنە دکتۆرەو پارێزەرو وەزیرو سەرەك وەزیران..هتد، تا لە ئەرك و کێشەی ئاژەڵداری رزگاربن، لەولایشەوە ئیسلام بەرنامەی گشت شارو لادێیەکە، ئەوانەیش وا داوا دەکەن کەژنان لەدەرەوەی ماڵەوە کاربکەن، دەبێ ئامادەیش بن کە هەر بەیانی تائێوارە شان بدەنە بەر گێرەو کێشەو پاچەکۆڵەو شوانیی مەڕومالآت و کارە جۆراوجۆرە قورسەکانی تر. نە تەنها بۆکاری دەولّەتیی و دائیرەکان کە بەیانیان بەسەیارەو ئارایشەوە بکەونە رێ، وا ئەزانم ژنان چەواشە کرابن، بۆیە داوای کاری دەرەوەی ماڵەوە ئەکەن، چونکە دەزانم نە لێیان دێت ئەوکارانە بکەن، وە نە ئامادەش دەبن، بێگومان ئەو ژنانەی دابەش بوون بەتەواوی جیهاندا، ئەگەر لەماڵەوە بهێنرێنە دەرەوە پڕ بەبالآیان تووشی زەرەروزیان دەبن، دیارە ئەو میراتەیش بەو رێژەیە پاش رەچاوکردنی ئەوهەموو ئیعتیبارانە دانراوە. وە ئەوەش بەزەیی ئیسلامە بەرامبەر بەژن. نەك سەیرکردنی بەمرۆڤی ژمارە دوو.

**دەرچوون لە فەرمانی خوا:**

﴿[١٣] تلك حدودالله﴾ ئەم یاسای میراتە -بۆتان باسکرا- سنوورەکانی خوان، دەبێ ئێوەش بەباشی ئاگاتان لێیان بێ ﴿ومن یطع الله ورسوله﴾ وهەرکەسێك بەرفەرمانی خواو پەیامبەرەکەی بکا وگوێرایەڵیان بێت ﴿یدخله جنات تجری من تحتها الأنهار﴾ خوا دەیخاتە ناو چەند باخ و باخاتێکەوە، کە ئاوو رووبار بە بەریاندا دەچێت ﴿خالدین فیها﴾ و بە هەتاهەتایش تێیایاندا ئەمێننەوە ﴿وذلك الفوز العظیم﴾ ئەوەشە سەرکەوتن و بەختیاریی گەورەومەزن ﴿[١٤] و من یعص الله و رسوله﴾ و هەر کەسێکیش لەفەرمانی خواو پەیامبەرەکەی دەرچێ و، بەگوێیان نەکات ﴿و یتعد حدوده﴾ و سنووری خواش ببەزێنێ ﴿یدخله نارا خالدا فیها﴾ ئەیخاتە ناو ئاگرێکەوە، بە هەمیشەیش تێیدا ئەمێنێتەوە ﴿و له عذاب مهین﴾ و سزایەکی ریسواکەریشی بۆ هەیە، کەوابوو هەرگیز سپاردەو وەسیەتەکانی خوا مەشکێنن، فەرموودەیەك دەڵێت: ژن وپیاوی وا هەیە، حەفتا سالّ خوا پەرستیی دەکەن، کەچی لەو ئاخرو ئۆخرەوە دەکەونە وەصیەتکردن و، ستەم وناهەقیی لەم ولەو دەکەن، جا بەوبۆنەوە دەچنە نێو ئاگرەوە. ترمزیی گێڕایەتیەوە ﴿[١٥] والتی یأتین الفاحشة من نسائکم﴾ ئەو ژنە موسڵمانانەشتان کاری فاحیشەو داوێنتەڕیی دەکەن، مێردیان هەبێ، یان نەبێ؟ ﴿فاستشهدوا علیهن اربعة منکم﴾ دەبێ چوار شایەت لەخۆتانیان لێبگرن ئەی موسڵمانان! بۆئەوکاتە جووتبوون ﴿فإن شهدوا فأمسکوهن فی البیوت﴾ ئینجا ئەر شایەتیان لەسەردان، دەبێ ئێوە لەماڵەکاندا رایانگرن و زیندانیان بکەن ﴿حتی یتوفاهن الموت﴾ تا ئەمرن ﴿أو یجعل الله لهن سبیلا﴾ یان خوا دەرەتان و رێگەیەکیان بۆ دائەنێت. بەڵێ.. لەسەرەتای ئیسلامدا هەرئافرەتێ: داوێن پیسی کردبا، دەبوو لەماڵ زیندانی بکرێ هەتا دەمرد، پاشان خوا سوورەتی (نوور)ی ناردو ئەم ئایەتەی ئێرەی نەسخ کردەوەو بڕیاری دا کە: ئەگەر مێردی کردبێت، دەبێت بەردە باران بکرێت هەتا دەمرێت، خۆئەگەر مێردی نەکردبێ و، تووشی ئەوکارە دزێوە بووبێ، سەد قامچی لێدەدرێ، دیارە لەسوورەتی (نوور)دا پتر رۆشن کراوەتەوە ﴿[١٦] واللذان یأتیانها منکم فآذوهما﴾ ئەو ژن و پیاوە موسڵمانە، یان ئەوکچ وکوڕەتان کە ئەوکارە دەکەن (زینا، یان نێربازی) دەبێ ئازاریان بدەن، واتە: سەرزەنشتیان بکەن، تەریقیان بکەنەوە، بەپێڵاو شتی وا لێیان بدەن. تۆڵەی داوێنپیسیی و کاری نێربازیی، لەسەرەتای ئیسلامەوە بەوجۆرە بوو، هەتا دوا بڕیاری یەکجارەکی خواهات ﴿فإن تابا وأصلحا﴾ جائەگەر پەشیمان بوونەوەو خۆیانیان چاککرد، واتە: دەستیان هەڵگرت لەو کارەدزێوە ﴿فاعرضوا عنهما﴾ جائێوەش

وازیان لێی بێنن و ئازاریان مەدەن، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ئەر کەنیزەتان زینای کرد، تۆڵەی لێ بسێنن، بەڵام بۆدوایی کەس بۆی نییە تانەو تەشەری لێ بدات. فتح الباری ﴿إن الله كان توابا رحيما﴾ چونکە بێ شك خوا هەمیشە لە تەوبەکاران دەبووریٰ و بە بەزەییە.

**تەوبە بەر لەگیانەلا قبوولە:**

﴿[١٧] إنما التوبة على الله للذين يعملون السوء بجهالة﴾ بەڕاستی خوا تەوبە تەنها لەوکەسانە وەرئەگرێ کە بەنەفامیی و نەزانیی خراپە دەکەن ﴿ثم يتوبون من قريب﴾ پاشان لەماوەیەکی نزیکدا پەشیمان دەبنەوەو تەوبە دەکەن ﴿فأولئك يتوب الله عليهم﴾ ئائەوانە خوا تەوبەیان لێوەرئەگرێ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((إن الله يَقْبَلُ توبةَ عبده مالم يُغَرْغِرْ)) پێشەوا ئەحمەد. ﴿وكان الله عليما حكيما﴾ و خوایش هەمیشە زاناو کارجوانە، ئەزانێ بڕیار چۆن بدا ﴿[١٨] وليست التوبة للذين يعملون السيئات﴾ و تەوبەو پەشیمانی بۆئەوانە نییە کە بەدرێژایی تەمەنیان، خەریکی گوناح و تاوانن ﴿حتى إذا حضر احدهم الموت﴾ تا لەسات و کاتی گیانەلاو مردندا ﴿قال إني تبت الآن﴾ دەڵێ: بێگومان لەوکارانەم پەشیمانم، دیارە ئەوجۆرە تەوبەیە لای خوا وەرناگیرێ، وەکو فەرموودەکەش بەڕاشکاوی ددانی پێوەدانا ﴿ولا الذين يموتون وهم كفار﴾ وە بۆ ئەوکەسانەش بەکافری دەمرن تەوبە قبووڵ نییە، واتە: ئەگەرچی لەکاتی سەرەمەرگیشدا تەوبە بکەن ، هەر لێیان وەرناگیرێ ﴿أولئك أعتدنا لهم عذابا أليما﴾ ئێمە سزایەکی ئێش پێگەیەنەرمان بۆئەوانە ئامادە کردووە.

**ڕێنماییەکانی ئایەتی (١٥-١٨):**

١- تۆڵەی زینا بەر لەسڕینەوەی بەئایەتی سوورەتی (نوور) و بڕیاری پێغەمبەر ﷺ لەبارەی ژن و پیاوی بەیەك گەیشتوو بەشێوەی شەرعیی و، پاشان زیناکردنیان بەبەردە باران، بەڵام بەو مەرجانەی زانایان باسیان لێدەکەن.

٢- دەبێ زووپەشیمان بنەوە ، ئەوانەی وا تۆبە ناکەن تاگیان دێتە سەر لوتیان و دەکەونە (غەرغەرە) لەوکاتەدا تەوبەیان لێ وەرناگیردرێ، ئەو کافرانەیش کە هیوایان بەژیان نامێنێ ئەوسا تەوبە دەکەن هەروا.

الجزء الرابع | سورة النساء

وَٱلَّٰتِي يَأۡتِينَ ٱلۡفَٰحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمۡ فَٱسۡتَشۡهِدُواْ
عَلَيۡهِنَّ أَرۡبَعَةٗ مِّنكُمۡۖ فَإِن شَهِدُواْ فَأَمۡسِكُوهُنَّ فِي
ٱلۡبُيُوتِ حَتَّىٰ يَتَوَفَّىٰهُنَّ ٱلۡمَوۡتُ أَوۡ يَجۡعَلَ ٱللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلٗا
﴿١٥﴾ وَٱلَّذَانِ يَأۡتِيَٰنِهَا مِنكُمۡ فَـَٔاذُوهُمَاۖ فَإِن تَابَا
وَأَصۡلَحَا فَأَعۡرِضُواْ عَنۡهُمَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ تَوَّابٗا رَّحِيمًا
﴿١٦﴾ إِنَّمَا ٱلتَّوۡبَةُ عَلَى ٱللَّهِ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٖ
ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٖ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡۗ وَكَانَ
ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمٗا ﴿١٧﴾ وَلَيۡسَتِ ٱلتَّوۡبَةُ لِلَّذِينَ
يَعۡمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ حَتَّىٰٓ إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ ٱلۡمَوۡتُ
قَالَ إِنِّي تُبۡتُ ٱلۡـَٰٔنَ وَلَا ٱلَّذِينَ يَمُوتُونَ وَهُمۡ كُفَّارٌۚ
أُوْلَٰٓئِكَ أَعۡتَدۡنَا لَهُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا ﴿١٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُواْ لَا يَحِلُّ لَكُمۡ أَن تَرِثُواْ ٱلنِّسَآءَ كَرۡهٗاۖ وَلَا تَعۡضُلُوهُنَّ
لِتَذۡهَبُواْ بِبَعۡضِ مَآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ إِلَّآ أَن يَأۡتِينَ بِفَٰحِشَةٖ
مُّبَيِّنَةٖۚ وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ فَإِن كَرِهۡتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰٓ
أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـٔٗا وَيَجۡعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيۡرٗا كَثِيرٗا ﴿١٩﴾

وإن أردتم | ٨٠

**بە زۆرداریی ژنان مەکەنە ماڵە میرات:**

(ئیبن عەبباس) دەڵێت: لەسەردەمی نەفامییدا ئافرەت هەروەکو کەلەپوور ئەم دەست و ئەودەستی پێدەکرا، ئەرکەسێك مردبا، خزم وکەس وکارەکەی، دەهاتن یا ژنەکەیان مارە دەکرد، وە یان ئەیاندا بە کابرایەکی تر، یان نەیان دەهێشت جارێکی تر مێرد بکاتەوە، ئەوجا خوای گەورە فەرمووی: ﴿[١٩] ياأيهاالذين آمنوا لا يحل لكم أن ترثوا النساء كرها﴾ ئەی ئەوکەسانەی بڕواتان هێناوە! بۆئێوە ڕەوانییە بە زۆرداری ژنان بکەنە میرات و دەستیان

بەسەرابگرن ﴿ولا تعضلوهن لتذهبوا ببعض ما آتیتموهن﴾ نابێ تەنگەتاویان بکەن و ئازاریان بدەن، لەبەرئەوە کە لەهەندێ لەومارەییەی پێتانداون دەسهەڵگرن ﴿إلا ان یأتین بفاحشة مبینة﴾ جامەگەر بەئاشکرا داوێن تەڕیی و زینا بکەن، یان هەرکارێکی تری نابەجێ بکەن، دیارە ئەوکاتە ڕەوایە ناچار بکرێن و تەڵاق بدرێن ﴿وعاشروهن بالمعروف﴾ بە باوونەریتێکی پەسەندو جوان هاوکارییان بکەن و مامەڵەتان چاك بێت لەگەڵیاندا، وەکو ئێوە چاوەڕوانی چاکە لەوانە دەکەن ﴿فإن کرهتموهن﴾ ئینجا ئەگەر بەهۆی لاسارییانەوە ژیان لەگەڵیاندا نەدەگونجا ددان بەخۆتاندا بگرن و ئێوە هەرچاك بن ﴿فعسى ان تکرهوا شیئا ویجعل الله فیه خیرا کثیرا﴾چونکە گەلێ شتی واهەیە ئێوە خۆشتان لێنایە، کەچی خوا خێرو چاکەیەکی زۆری تیا داناوە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((خَيْرُكُمْ خَيْرُكُمْ لِأَهْلِهِ، وأنَا خَيْرُكُمْ لِأَهْلِي)) ئەبوو داوود.

### ئەگەر کلورێك دراوو پارە مارەیی ژنان بێ ، لێیان مەسێننەوە:

﴿[٢٠] وان اردتم استبدال زوج مکان زوج﴾ ئەگەر ویستتان ژنێك بخەنە جێگای ژنێکی ترەوە، واتە: ژنێك تەڵاق بدەن‌و ژنێ تر بێنن ﴿وآتیتم إحداهن قنطارا﴾ بەژنەکەی پێشووتان زێڕو داراییەکی زۆرتان دابوو ﴿فلا تأخذوا منه شیئا﴾ نابێ هیچ شتێکی لێ وەربگرنەوە. ئەگەرچی کلوورێکیش بێت، لەم ئایەتەوە وا بەدیار دەکەوێ کە ڕەوایە ماڵێ زۆر بکرێتە مارەیی ژنان، ئەگەر (عومەر- خ) ماوەیەك ڕێی لێگرت وپاشان هاتەوە سەر ڕای گشتیی و، بەڵام بێ شك چەندە ئاسانکاری بۆ بەیەکگەیاندنی کچ و کوڕێك بکرێ، هێمان هەر کەمە، پێشەوا (عومەر)یش وەکو سوڵتەو فەرمانڕەوا هەقیەتی نەهێڵێ کۆمەڵێ گیروگرفت بخرێتە بەردەم کیژان ولاوانەوە، لەلایەن هۆزی خەزوورانەوە، یان لەلایەن کۆمەڵگەی گەندەڵ و فاسیدەوە، ئەمەش کەخوای گەورە ڕێگای داوە مارەیی ژنان هەرچەندە بێت قەیدی نییە، بێگومان ئەمە بۆگەڕانەوەی شەخصییەت و کەسێتی ژنانە، بەتایبەتی ئەو دەمە کە: ژن کرابوویە میرات و کەلەپوور، لەگەڵ ئەمەشدا فەرموودە گەلێ هەیەو داوادەکەن کە: هەوڵبدرێ زێدەڕەویی لەمارەییدا نەکرێت، بەتایبەتی بۆخەڵکانی بێ تواناو بێ دەسەلاّت، دینی ئیسلام ڕازییە بەهەر جۆرێك کە کچ وکوڕەکە لەسەری ڕێك دەکەون، ڕازییە -بەمەرجێ کچەکە ڕازیی بێ- مارەییەکەی ئەڵقەیەکی زێڕ بێت، یان سوورەتێکی قورئان بێت. ﴿أتأخذونه بهتانا وإثما مبینا﴾ دەتانەوێ بەبوختان‌و خۆ تووشی گوناحکردن بەئاشکرا بیسێننەوە لێیان و درۆیان بۆهەڵبەستن‌و ناچاریان بکەن دەست لەمارەییەکەیان هەڵگرن؟ ﴿وکیف تأخذونه﴾ جا چۆن دروستە لێیان وەرگرنەوە ﴿وقد أفضى بعضکم إلى بعض﴾ کە ئێوە پێکەوە بوون‌و بەیەك گەیشتبوون، واتە: کاری شەرعیتان



وَإِنْ أَرَدتُّمُ ٱسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَّكَانَ زَوْجٍ وَءَاتَيْتُمْ
إِحْدَىٰهُنَّ قِنطَارًا فَلَا تَأْخُذُوا۟ مِنْهُ شَيْـًٔا ۚ أَتَأْخُذُونَهُۥ
بُهْتَٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴿٢٠﴾ وَكَيْفَ تَأْخُذُونَهُۥ وَقَدْ أَفْضَىٰ
بَعْضُكُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ وَأَخَذْنَ مِنكُم مِّيثَٰقًا
غَلِيظًا ﴿٢١﴾ وَلَا تَنكِحُوا۟ مَا نَكَحَ ءَابَآؤُكُم مِّنَ
ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَمَقْتًا
وَسَآءَ سَبِيلًا ﴿٢٢﴾ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَٰتُكُمْ
وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَٰتُكُمْ وَعَمَّٰتُكُمْ وَخَٰلَٰتُكُمْ وَبَنَاتُ
ٱلْأَخِ وَبَنَاتُ ٱلْأُخْتِ وَأُمَّهَٰتُكُمُ ٱلَّٰتِىٓ أَرْضَعْنَكُمْ
وَأَخَوَٰتُكُم مِّنَ ٱلرَّضَٰعَةِ وَأُمَّهَٰتُ نِسَآئِكُمْ
وَرَبَٰٓئِبُكُمُ ٱلَّٰتِى فِى حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ
ٱلَّٰتِى دَخَلْتُم بِهِنَّ فَإِن لَّمْ تَكُونُوا۟ دَخَلْتُم بِهِنَّ
فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ وَحَلَٰٓئِلُ أَبْنَآئِكُمُ ٱلَّذِينَ
مِنْ أَصْلَٰبِكُمْ وَأَن تَجْمَعُوا۟ بَيْنَ ٱلْأُخْتَيْنِ
إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٢٣﴾

کردووه ﴿وأخذن منكم ميثاقا غليظا﴾ و ئەوانیش پەیمانێکی قایم و ئەستووریان لێوەرگرتوون، واتە: نیکاح و مارەکراون بۆتان، دەسا خۆشەویستیی نێوانتان بخوێننەوە؟

رێنماییەکانی ئایەتی (١٩-٢١):

١- هەڵوەشانەوەی باوی بەمیراتکردنی ژنان وئازاردانیان بەمەبەستی دەست هەڵگرتنیان لەمارەییان، مەگەر زینابکەن، یائیتاعەی مێرد نەکەن، ئەوکات دەتوانێ نائاسایی بێت لەگەڵیا، هەتا خۆی بکڕێتەوەو دەس لەمارەییەکەی هەڵبگرێ، وەیان تەڵاقی بدات لەسەر زیاتر لەمارەییەکەی خۆی.

٢- مارەیی ژنان هەرچەند زۆربێ، بۆیان حەڵاڵ و رەوایە، ئەگەرچی بەرەکەتیش لەوەدایە مارەیی کەم‌و سووک بێت.

٣- دەبێ ماوەی پەیمان و متمانە بەیەکتر دان و، گۆڕینەوەی خۆشەویستی لەیاد نەکرێت.

**ژنی بابتان نەخوازن و مارەی مەکەن:**

(قەیس) کەبابی مرد ویستی -لەسەر باوی جاهیلییەت- باوەژنەکەی مارەبکا، جا باوەژنەکەشی خۆی بەدەستەوە نەداو گوتی: من بەکوڕی خۆمت ئەزانم، شتی واچۆن دەبێ، بۆیە ملی پێنەداو، دەرەنجام چوون لەپێغەمبەر ﷺ یان پرسی، ئەوسا ئەم ئایەتە هات و فەرمووی: ﴿[22] ولا تنحكوا ما نكح آباؤكم من النساء﴾ ئەو ژنانە مەخوازن کە باوکتان مارەی کردوون بۆخۆیان، واتە: ژنی باوکت (باوەژن) یاساغە لێت، لەبەر حورمەت و رێزی باوکایەتی. لەم ئایەتەدا روون نەکراوەتەوە: ئاخۆ مەبەست بەنیکاح تەنها (عەقد)ە، یان (عەقد) و (وطء)یشە؟ بەڵام لەسوورەتی (ئەحزاب: ٤٩)دا هاتووە: (ياأيهاالذين آمنوا إذا نكحتم المؤمنات ثم طلقتموهن من قبل أن تمسوهن) کە مەبەست پێی تەنها (عەقد)ە، واتە: هەر بەمارەکردنی بۆ باوك لەکوڕ حەرام دەبێ، ئیجماعی زانایان لەسەر ئەوەیە کە بۆکوڕەکەیش هەروایە. ﴿إلا ما قد سلف﴾ مەگەر ئەوەی کەلەسەردەمی نەفامییدا بووە، بۆئەوە گوناهتان لەسەر نابێ، چونکە تێپەڕیوە، ئیمامی (تەبەری) دەڵێ: خەڵکانی پێش ئیسلام باوەژنی خۆیانیان لەخۆ مارەئەکرد ! ﴿إنه كان فاحشة ومقتا﴾ چونکە بێگومان مارەکردن‌و سەرجێیی ئەمانە کارێکی زۆر ناپەسەندو، زۆر نابەجێ و بێزراوە ﴿وساء سبيلا﴾ رێبازێکی زۆر خراپ و ناشیرینیشە ئەو یاسایە.

**ئەم ژنانە مەخوازن:**

﴿[23] حرمت عليكم امهاتكم﴾ دایکتان، واتە: دایکی خۆتان و دایکی باوك و دایکی دایك حەرامە ﴿وبناتكم واخواتكم﴾ و کچانتان و خوشکانتان، کوڕەزاو کچەزایش.. هەروا خوشکی باوك ودایکیی بن، یان هەر باوکی یان دایکی بن ﴿وعماتكم﴾ و پورتان خوشکی باوك ﴿وخالاتكم﴾ پوورتان (خوشکی دایك) ﴿وبنات الأخ وبنات الأخت﴾ کچی براو کچی خوشك (برازاو خوشکەزا) ﴿وامهاتكم اللاتى ارضعنكم﴾ ئەو ژنانەی بەساوایی شیریان پێداون (دایکی شیریتان) ﴿و اخواتكم من الرضاعة﴾ ئەوکچانەی هاوشیرتان بوون ﴿و امهات نسائكم﴾ و دایکی ژنانتان (خەسووتان) ﴿وربائبكم اللاتى فى حجوركم﴾ و ئەو کچانەی خۆتان بەخێوتان کردون (زڕ کچ، کوڵەبەس) ﴿من نسائكم اللاتى دخلتم بهن﴾ لەو ژنانە بن کەئێوە چووبنە لایان. بەڵێ ئەگەر ژنان پێش چوونەلایان تەڵاقدران، ئەرکچەکانیان مارەبکەن قەیدی نییە ﴿فإن لم تكونوا دخلتم بهن﴾ خۆئەگەر لەگەڵیان نەخەوتبوون ﴿فلا جناح عليكم﴾ گوناحێکتان لەسەر ناکەوێ کچەکانیان مارە بکەن، واتە: ئەر ئەو دایکە نیکاح کرا بۆ باب، پاشان -بەرلە گواستنەوە- تەڵاقدرا، کوڕ دەتوانێ کچەکەی مارە بکات، بەڵام پێچەوانەکەی نابێت ﴿وحلائل ابنائكم الذين من

اصلابكم﴾ هەروەها قەدەغەیە حەڵاڵی ئەوكوڕانەیشتان مارەبكەن، كە بەراستی لەپشتی خۆتان بن، واتە: بووك، دیارە ئەمە ژنی كوڕەزاو كچەزایش ئەگرێتەوە، لەم ئایەتەوە وەرئەگیرێ كە ژنی بەكوڕ كراو (دَعِيّ) مارەكردنی یاساغ نییە.. ئەمەش بەئاشكراتر لەسورەتی (ئەحزاب: ٣٧)دا هاتووە: (فلما قضى زيد منها وطرا زوجناكها لكى لا يكون على المؤمنين حرج فى أزواج ادعيائهم إذا قضوا منهن وطرا وكان أمر الله مفعولا) وە لەسوورەتی (ئەحزاب: ٤)دا ئەفەرموێ: (وماجعل ادعيائكم ابنائكم ذلكم قولكم بأفوا هكم) دیسان لەسوورەتی (ئەحزاب: ٤٠)دا هاتووە: (ماكان محمد أبا أحد من رجالكم). مارەكردنی ژنی كوڕی شیریش قەدەغەیە، لە فەرمودەیەكی (متفق عليه)دا هاتووە: (يَحْرُمُ من الرضاع مايَحْرُمُ من النَّسَبِ)، واتە: هەر ژنێك بەهۆی (نەسەب) و رشتەوە مارەكردنی حەرام بێت، بێگومان بەشیر خواردنیش حەرام دەبێت. ﴿وان تجمعوا بين الأختين﴾ دوو خوشكیش پێكەوە كۆ بكەنەوە و بییانكەنە هاوسەری خۆتان رەوانییە، واتە: نابێ دوو خوشك بكەیتە ژنی خۆت لەیەك كاتدا، دووپووریش، یان ژنێك و پووری هەروا ﴿إلا ماقد سلف﴾ مەگەر لەرابووردوودا بەسەرتانا هاتبێ، لەسەردەمی نەزانی و نەفامییدا كردبێتان، ئەوە تێپەڕیوەو لەسەرتان ناكەوێ ﴿إن الله كان غفورا رحيما﴾ بەراستیی خوا سەبارەت بەوانە، هەمیشەو بەردەوام زۆر لێبوردەو دلۆڤان و میهرەبانە.

رێنماییەكانی ئایەتی (٢٢-٢٣): شێوەكانی ژن مارەكردنی سەردەمی جاهلیەت، ئەوشێوەیان نەبێ ئیسلام ددانی پێداناوە هەموو جۆرەكانی تری حەرامە، بەتایبەتی ژنی باوك (باوەژن) هەر بەمارەكردنی لەلایەن باوكەوە لەكوڕ قەدەغە دەبێ، وە بەفەرموودەی (موتەواتر)یش ژن لەگەڵ پووردا، وە لەگەڵ دایكی ژنەكە خۆیدا، سەرجێیی لەگەڵ كرابێ یانا؟ خۆئەگەر مارەی بكا، پاشان بەر لەچوونەلای تەڵاقی بدا، دەتوانێ كچەكەی مارە بكا، وەك لەفەرموودەی (متفق عليه)دا هاتووە: ((إذا نَكَحَ الرجلُ المراةَ فلا يَحِلّ له أن يتزوجَ أمَّها، دَخَلَ بالبنت أو لم يَدْخُلْ، وإذا تزوج الأم فلم يدخل بها ثم طلقها فإن شاء تزوج البنت))، واتە: هەركە پیاو ژنێكی مارەكرد، بۆی نییە دایكەكەشی بخوازێ، ئیتر سەرجێیی لەگەڵ كچەكەدا كردبێت، یان نا، بەڵام ئەگەر دایكەكەی خواست و، پێش سەرجێیی تەڵاقی دا، دەتوانێ كچەكەی بخوازێ. دایكی شیریی و كچ و خوشكەكانی (بەمەرجەكانی خۆی) كە لەكتێبەكاندا نووسراون، هەورەها پورو برازاو خوشكەزای شیریی، و بەهۆی ژن خواستنیشەوە باوەژن (تێكەڵی لەگەڵ كرابێ یان نا)، كۆڵەوەس (زڕكچ) ئەگەر لەگەڵ دایكەكەیدا دەستی تێكەڵ كردبێ، بووك، كوڕەكەی چووبێتە لای یان نا؟ (قورتوبیی) ئەڵێ: هەركاتێ پیاوێ ژنێكی مارە كردو، نیكاحەكەی بەتاڵ دەرچوو، سەرجێیشی لەگەڵ كرد، ئیتر بۆ بابیی و بۆ كوڕیی و بۆ باپیرەیی و بۆ هەموو نەوەكانی ئەوپیاوە حەرام دەبێ.

كۆتایی جزمی چوارەم

ولله الحمد والمنة

*** *** ***

* ﴿[٢٤] والمحصنات من النساء إلا ما ملكت ايمانكم﴾ ئەو ئافرەتانەیشتان پێناشێ مێردیان هەیەو ئازادن، یان كەنیزەن، مەگەر ئەو كەنیزانەی لەجەنگدا دەستتانكەوتوون و بوونەتەماڵتان، ئەمانە ئەگەرچی مێردیشیان هەبێت حەڵاڵن بۆتان، بەومەرجە دوو گیان نەبن، خۆئەگەر دووگیانبوون، ئەوە پاش دانانی سكەكەیان مارە كردنیان حەڵاڵ دەبێ، دیسان بەم مەرجەش موسڵمان ببن و باوەڕ بێنن، وەیان ئەوكەسەی كە بەبەشی جەنگیی وەریدەگرێ، رەفاقەتی لەگەڵ بكابە موڵكیەت. ئەم ئایەتە لەرووداوەكەی رۆژی (حونەین/ ئەوتاس)دا هاتە خوارێ، ئەورۆژەی كە

هەندیٚ ژن دیلکرابوون و، هاوەڵانیش نەیان دەزانی چۆن رەفتاریان لەگەڵ بکەن، ئەوسا ئەوئایەتە هاتەخواریٚ. ﴿کتاب الله علیکم﴾ خوا خۆی ئەم سنوورانەی بۆدیاریکردوون و بۆی بڕیار داون، دەبیٚ ئیٚوەش چاك رەفتاریان لەگەڵ بکەن ﴿وأحل لکم ما وراء ذلکم ان تبتغوا بأموالکم﴾ بیٚجگە لەوانە ریٚتان پیٚدراوە کە بەماڵ ودارایی خۆتان ئافرەتانی تر تا چوارمارە بکەن بەشیٚوەی شەرعیی ﴿محصنین غیر مسافحین﴾ و بەداویٚنپاکی، نەبەداویٚن پیسیی وناجوامیٚرانە، واتە: لەمارەکردنیاندا دەبیٚ یاساو مەرجەکانی نیکاح ڕەچاو بکریٚن، ئەگەرنا ئەوکارەیە بە (سەفاح) و داویٚن پیسیی وزینا دادەنریٚ ﴿فما استمتعتم به منهن فاتوهن اجورهن فریضة﴾ ئینجا لەگەڵ هەر ژنیٚکیاندا بوونە هاوسەر دەبیٚ لەبەرامبەر ئەو لەزەتەوە مارەییيان بدەنیٚ، چونکە خوای گەورە بۆی دیاریکردوون، کەوابوو هەرچۆنیٚ ئیٚوە لەزەتیان لیٚوەرئەگرن بەهۆی مارە کردنیانەوە، دەبیٚ ئاوایش مارەییيان بدەنیٚ، ئەمەیش لەئایەتی (٢١/نیساء)دا فەرموویەتی: (وکیف تأخذونه وقد أفضى بعضکم إلى بعض)، وە لە ئایەتی: (٤٠/ نیساء): (وآتوا النساء صدقاتهن نحلة)، وە لەسوورەتی (بەقەرە): (ولا یحل لکم أن تأخذوا مما آتیتموهن شیئا) ئەو مارەییيە بەروونتر باسکراوەو هاتووەو مەبەستیش بەم ئایەتە: (فمااستمتعتم به منهن) مارەکردنە بەهەتاهەتایی و مارە پیٚدانیانە. زاناکانیش دەڵیٚن: ئەم ئایەتەی: (فمااستمتعتم به منهن ..) مارەکردنی هەمیشەیی دەگەیەنیٚت، نەك نیکاحی کاتی و لەزەت وەرگرتن بۆماوەیە، کە پیٚیدەڵیٚن: (نکاح المتعه) ئەگەرچی وشەی (أجورهن)یشی تیٚدا هاتبیٚ و، تۆزیٚ گومان لەمەسەلەکەدا پەیدا بکا، چونکە بیٚگومان کەبیٚژەی (اجورهن) لەجیٚگای تردا بەمانای مارەیی هەتاهەتایی هاتووە، وەك لەسوورەتی (نیساء)دا فەرموویەتی: (فانکحوهن بإذن أهلهن وآتوهن أجورهن) وە لەسوورەتی (مائیدە: ٥)دا فەرموویەتی: (و المحصنات من المؤمنات والمحصنات من الذین أوتوا الکتاب من قبلکم إذا آتیتموهن أجورهن) هەرچەندە دەڵیٚن: (ئیبن عەبباس و ئوبەی کوڕی کعب و سەعیدی کوڕی جوبەیرو سەدیی) بەم شیٚوەیان خویٚندۆتەوە: (فمااستمتعتم به منهن إلى اجل مسمى)، گوایا بەپیٚی ئەو خویٚندنەوەیە دەبیٚ (نکاح المتعه) ریٚی پیٚدرابیٚ، بەڵام زانایانی دیکە بەم بەڵگانەی خوارەوە ئەو بۆچوونە دەدەنە دواوەو دەڵیٚن:

١- وشەی (إلى أجل مسمى) کەلە (ئیبن مەسعوود)ەوە هاتووە، بەتەواوی روون نەبووەتەوە کە ئاخۆ لەقورئانە یان؟ چونکە هاوەڵان گشت یەك دەنگ بوون کە نابیٚ لەقورئانەکەی پیٚشەوا عوسماندا بنووسریٚت، زانایانی (ئوصول)یش ئەڵیٚن: (إن ما قراه الصحابی على انه قرآن، ولم یثبت کونه قرآنا لا یستدل به على شئ). ئەوەی هەر هاوەڵیٚك بەقورئانی بخویٚنیٚتەوە, بەڵام ئیسبات نەبوبیٚ قورئانە، ناکریٚ بەبەڵگە بۆ هیچ شتیٚك.

الجزء الخامس | سورة النساء

وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡۖ
كِتَٰبَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡۚ وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَآءَ ذَٰلِكُمۡ أَن تَبۡتَغُواْ
بِأَمۡوَٰلِكُم مُّحۡصِنِينَ غَيۡرَ مُسَٰفِحِينَۚ فَمَا ٱسۡتَمۡتَعۡتُم بِهِۦ
مِنۡهُنَّ فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةٗۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ
فِيمَا تَرَٰضَيۡتُم بِهِۦ مِنۢ بَعۡدِ ٱلۡفَرِيضَةِۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا
حَكِيمٗا ﴿٢٤﴾ وَمَن لَّمۡ يَسۡتَطِعۡ مِنكُمۡ طَوۡلًا أَن يَنكِحَ
ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ فَمِن مَّا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُم مِّن
فَتَيَٰتِكُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِۚ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِإِيمَٰنِكُمۚ بَعۡضُكُم مِّنۢ
بَعۡضٖۚ فَٱنكِحُوهُنَّ بِإِذۡنِ أَهۡلِهِنَّ وَءَاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ
بِٱلۡمَعۡرُوفِ مُحۡصَنَٰتٍ غَيۡرَ مُسَٰفِحَٰتٖ وَلَا مُتَّخِذَٰتِ
أَخۡدَانٖۚ فَإِذَآ أُحۡصِنَّ فَإِنۡ أَتَيۡنَ بِفَٰحِشَةٖ فَعَلَيۡهِنَّ نِصۡفُ
مَا عَلَى ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ مِنَ ٱلۡعَذَابِۚ ذَٰلِكَ لِمَنۡ خَشِيَ
ٱلۡعَنَتَ مِنكُمۡۚ وَأَن تَصۡبِرُواْ خَيۡرٞ لَّكُمۡۗ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ
﴿٢٥﴾ يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُبَيِّنَ لَكُمۡ وَيَهۡدِيَكُمۡ سُنَنَ ٱلَّذِينَ
مِن قَبۡلِكُمۡ وَيَتُوبَ عَلَيۡكُمۡۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴿٢٦﴾

٨٢ | وَٱللَّهُ يُرِيدُ

٢- گریمان ئەگەر وەك (خبر الآحاد)یش بێ، كە هەندێك دەڵێن ئەبێتە بەڵگە، وە یان تەفسیری هاوەڵان بێت، ئەوە بەم بەڵگە بەهێزانە رەت كراوەتەوە:

یەكەم: كۆی زانایان لەسەر ئەوەیە كە (نكاح المتعە) سڕاوەتەوەو نەماوە.

دووەم: فەرموودەی راست و دروست هەیە، وەك پێشەوا (موسلیم) هێناویەتی ودەفەرموێ: ((یا أیهاالناس إنی قد كنت أذنت لكم في الإستمتاع من النساء ، وإن الله قد حرم ذلك إلى یوم القیامة، فمن كان عنده منهن شئ فلیخل سبیله، ولا تأخذوا مما آتیتموهن شیئا)) واتە: ئەی خەڵكینە! من بەرلە ئێستا بەشێوەیەكی كاتیی مۆڵەتمدان بەهرەو لەزەت لەژنان وەرگرن ، بەڵام دڵنیابن كە لەم رۆژەوە خوای لەكارزان تارۆژی قیامەت حەرامی كرد، ئەوجا ئەوكەسەی ژنێكی بەو جۆرەی لابێ، بارێگەی بداو بچێ بۆخۆی مێرد بكاو ئێوەش مارەییەكەی بدەنێ.

٣- گریمان ئەگەر ئەم ئایەتەش (نكاح المتعة) بگەیەنێت، ئەوا دیسان هەر بەچەند فەرموودەیەكی راست و دروست هەڵوەشاوەتەوە، ئەوەتە جارێك سڕینەوەی لە خەیبەردا لەسەر زمانی (عەلی كوڕی ئەبووتالب)دا هاتووە: (عن علی بن أبی طالب..: البخاری فی المغازی، حدیث رقم (٤٢١٦) و فی النكاح، حدیث (٥١١٥)، والذبائح، حدیث (٥٥٢٣). ومسلم فی النكاح)، جارێكی تریش لە (فەتحی مككە) دا راگەیەنرا .(مسلم حدیث (٢١) كتاب النكاح).

﴿ولا جناح علیكم فیما تراضیتم به من بعد الفریضة﴾ هیچ گوناهێكتان لەسەر نابێ گەر لەسەر كەمكردنەوەی مارەیی ڕیبكەون لەنێوان خۆتاندا: ژنەكە هەندێكی لێ لاببات، یان مێردەكە بۆ ژنەكەی زیادبكات، واتە: ژنەكە دەتوانێ مێرد لەمارەیی ئازاد بكا، مێردیش دەتوانێ بۆی زیاد بكا ﴿إن الله كان علیما حكیما﴾ چونكە بێگومان خوا هەردەم زانایە بە بەرژەوەندییەكانی مەردوم، كار دروستیشە، هەرچی بەكەڵكیان بێت ئەوەیان بۆ دادەنێ ﴿[25] و من لم یستطع منكم طولا﴾ ئەوجا هەركەسێكیشتان لەبەردەستەنگی ماڵیی، تواناو دەسەڵاتی نەبوو ﴿أن ینكح المحصنات المؤمنات﴾ ژنانی ئازادی داوێنپاكی بڕوادار مارە بكات ﴿فمنْ ما ملكت ایمانكم من فتیاتكم المؤمنات﴾ با لەو كیژە (كەنیزە) بڕوادارانە بوونەتە ماڵتان مارە بكات, واتە: تا دەتوانێ دەبێ ژنێكی ئازادو موسڵمان بخوازێت , جائەگەر دەسەڵاتی ئەوەی نەبوو ئەوجا كەنیزە مارە بكا, بەمەرجێ ترسی تووشبوونی زینای هەبێ، ئەگەر كەنیزە مارە نەكا، خۆئەگەر كەسێ ژنێكی ئازادی داوێنپاكی باوەڕداری هەبوو، دیارە ئیتر نابێ كەنیزە مارەبكا ﴿والله أعلم بإیمانكم﴾ خواش لەهەر كەس چاكتر رادەی ئیمانتان دەزانێ، تەنها ئەو ئەزانێ باوەڕتان هەیە یا نا، چونكە باوەڕ شتێكی نهێنییە ﴿بعضكم من بعض﴾ ئێوە هەمووتان لەتیرەی یەكتن، كەس لەكەس مەزن و گەورەتر نییە، چونكە هەمووتان لەئادەمن، جاكەوابوو عارتان لێنەیەت ئەوكەنیزانە مارە بكەن ﴿فانكحوهن بإذن أهلهن﴾ بەپێی مۆڵەت و دەستووری خاوەنەكانیان مارەیان بكەن ﴿وآتوهن أجورهن بالمعروف﴾ چۆن باوە لەناوخۆتاندا مارەییان بدەنێ, فرو‌فێڵیان لەگەڵ مەكەن و بەسووك وكەم تەماشایان مەكەن ﴿محصنات غیر مسافحات﴾ بەو مەرجە ئەوانیش داوێن پاكبن و داوێن پیس نەبن ﴿ولا متخذات اخدان﴾ و بە نهێنیش دۆست و یاری نێرینەیان نەبێ بۆ رابواردنیان ﴿فإذا احصن﴾ جائەگەر مێردیان كرد ﴿فإن آتین بفاحشة﴾ وئینجا ئەگەر داوێن پیسییان كرد ﴿فعلیهن نصف ما على المحصنات من العذاب﴾ ئەوە نیوەی ئازاری ژنانی شوودارو ئازادیان لەسەرە، واتە: تەنها پەنجا شەلاقیان لێدەن لەگەڵ (٦) مانگ دوور خستنەوە ﴿ذلك لمن خشی العنت منكم﴾ مارەكرنی ئەو كەنیزانە بۆئەوانەیە رەبەنیی ئازاریان دەداو ترسی تووشی هەڵەیان هەیەو توانای مارەكردنی ژنی ئازادیان نەبێ، وەك جەماوەری زانایان جگە لە ئەبوحەنیفە ئەڵێن: ئەبووحەنیفە (خ) پێی وایە: هەركەسێك ژنی ئازادی نەبێت، دەتوانێ كەنیزەی موسڵمان، یان

خاوەن نامە مارەبکات، ئیتر دەسەلاّتی مارەکردنی ژنی ئازادی هەبێ، یان نەبێت؟ ترسی تووشبوونی زینای هەبێ، یان نا؟ بە بەڵگەی ئایەتی: (والمحصنات من الذين أوتوا الكتاب من قبلكم..). بەڵێ ژنانی کەنیزە – کە ئیسلام ڕێگا دەدا ژن ومێردییان لەگەڵ بکرێت– ئەوژنانە بوون کە لەجەنگە ئیسلامییەکاندا دیل دەکران و بێ مێرد دەکەوتن، جا بۆئەوە بێبەش نەبن لە تێکەڵی ژن ومێردیی, پاش تەواوبوونی عیددەیان مارە دەکرێن ﴿وأن تصبراو خير لكم﴾ لەهەمانکاتدا خۆراگربن و کەنیزە مارەنەکەن تا خوا دەرووتان لێدەکاتەوە, چاکترە بۆتان، چونکە نەوەکانتان نابنە کۆیلەو بەندە ﴿والله غفور رحيم﴾ و خوایش زۆر لێبوردەیە، دلۆڤان و میهرەبانە.

## ڕێنمایەکانی ئایەتی (٢٤–٢٥):

١– مارەکردنی ژنی خاوەن مێرد بۆهیچ کەسێك ڕەوانییە, مەگەر لەمێردەکەی جیابێتەوە بەتەلاق ، یا بەمردن ، پاشانیش عیدەی بەسەر بچێ، بەلاّم کەنیزەی جەنگیی ئەگەرچی مێردیشی هەبێ، پاش بڕواهێنانیی و بەسەر چوونی عیددەی مارە دەکرێ، چونکە بە ئیسلامبوونی ژنەکە لەیەك حەرام ئەبن.

٢– مارەیی بۆ ژنان واجب و پێویستە، ژنان دەتوانن هەندێ لەمارەییەکەیان ببەخشن بە مێردەکانیان.

٣– هەرکەنیزەیەك موسڵمان بوو و زینای کرد, ئەوە نیوەی ژنە ئیمانداریکی ئازاد تۆڵە دەدرێ.

٤– مارە نەکردنی کەنیزە –ئەگەرچی دەسەلاّتی مارەکردنی ژنی ئازادیشی نەبێ– باشترە، چوون ئیمامی (عومەر) دەڵێ: هەرکەسێ کەنیزە مارەبکا، منداڵەکەی دەبێتە بەندە ﴿[26] يريدالله ليبين لكم﴾ خوا دەیەوێ بەو بڕیارانە دەیدا هەرچی بە کەڵکتان بێت لە حەلاڵ و حەرام بۆتان روون بکاتەوە ﴿ويهديكم سنن الذين من قبلكم﴾ ولە ڕێو شوێنی پێشینانیشتان– پەیامبەران و پیاوچاکان– شارەزاو ڕێنماتان بکات, تائێوەیش چاولەوان بکەن ﴿ويتوب عليكم﴾ و تەوبەو پەشیمانیشتان لێوەرگرێ ﴿والله عليم حكيم﴾ و خواش زۆر زانایە بە ئەحواڵی بەندەکانی، کارزان و کارجوانە بۆدانانی پلان وئەحکام بۆ یان ﴿[27] والله يريد أن يتوب عليكم﴾ خوا ئەیەوێ تەوبەو پەشیمانیتان لێوەرگرێت.

الجزء الخامس | سورة النساء

وَٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يَتُوبَ عَلَيۡكُمۡ وَيُرِيدُ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ
ٱلشَّهَوَٰتِ أَن تَمِيلُواْ مَيۡلًا عَظِيمٗا ٢٧ يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُخَفِّفَ
عَنكُمۡۚ وَخُلِقَ ٱلۡإِنسَٰنُ ضَعِيفٗا ٢٨ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُواْ لَا تَأۡكُلُوٓاْ أَمۡوَٰلَكُم بَيۡنَكُم بِٱلۡبَٰطِلِ إِلَّآ أَن
تَكُونَ تِجَٰرَةً عَن تَرَاضٖ مِّنكُمۡۚ وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمۡۚ
إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمۡ رَحِيمٗا ٢٩ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ عُدۡوَٰنٗا
وَظُلۡمٗا فَسَوۡفَ نُصۡلِيهِ نَارٗاۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ
يَسِيرًا ٣٠ إِن تَجۡتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنۡهَوۡنَ عَنۡهُ نُكَفِّرۡ
عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَنُدۡخِلۡكُم مُّدۡخَلٗا كَرِيمٗا ٣١
وَلَا تَتَمَنَّوۡاْ مَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بِهِۦ بَعۡضَكُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖۚ لِّلرِّجَالِ
نَصِيبٞ مِّمَّا ٱكۡتَسَبُواْۖ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٞ مِّمَّا ٱكۡتَسَبۡنَۚ
وَسۡـَٔلُواْ ٱللَّهَ مِن فَضۡلِهِۦٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَيۡءٍ
عَلِيمٗا ٣٢ وَلِكُلّٖ جَعَلۡنَا مَوَٰلِيَ مِمَّا تَرَكَ ٱلۡوَٰلِدَانِ
وَٱلۡأَقۡرَبُونَۚ وَٱلَّذِينَ عَقَدَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡ فَـَٔاتُوهُمۡ
نَصِيبَهُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدًا ٣٣

٨٣

**سەرنجێك:** دووپاتکردەوەی تەوبە لێرەدا ئاماژەیە بەوە کە بەزەیی خوا فراوانەو، بۆئەوەی ئەوانیش لە تەوبەکردن کۆڵ نەدەن ﴿و يريد الذين يتبعون الشهوات﴾ ئەوکەسانەش دەکەونە شوێنی هەواو ئارەزوو ئەیانەوێ ﴿أن تميلوا ميلا عظيما﴾ بەتەواوی ئێوە لە خشتەبەرن و لاڕێ بن و هەرخەریکی کاری دزێوو ناشیاوبن ﴿[28] يريدالله أن يخفف عنكم﴾ خوا ئەیەوێ بەم بەرنامانە کاروبارتان بۆئاسان بکات ﴿و خلق الإنسان ضعيفا﴾ چونکە ئادەمیزاد

لەبارەی ئەویندا بەلاوازو کزویی هێز دروستکراو لەبەردەم ئارەزووکانییدا گەلێ جار خۆی بۆناگیرێ بۆیە خواش مۆڵەتی مارەکردنی کەنیزەی بۆداون.

**بە سەوداو مامەڵەو رازیی بوون نەبێ ، ماڵی یەکدی مەخۆن:**

﴿[29] یاایها‌الذین آمنوا لا تأکلوا اموالکم بینکم بالباطل﴾ ئەی ئەوکەسانەی باوەڕتان هێناوە! ماڵ و سامانی یەکتری لەخوت و خۆڕایی مەخۆن، واتە: بە دزیی و گزیی و داگیرکردن و بەرتیل و (یانسیب) و نوشتەو فاڵ گرتنەوەو.. هتد ﴿إلا أن تکون تجارة عن تراض بینکم﴾ مەگەر لەرێگەی سەوداو بازرگانیی و رەزامەندی نێو خۆتانەوە بێت، واتە: هۆی ناپەسەند بەکار مەهێنن بۆ زیاد کردنی دارایی خۆتان، بەڵکو دەبێ هەر ڕێگەی بازرگانیی وکڕین و فرۆشتن بگرنەبەر، کەئەویش چاکترین ڕێگایە بۆ ژیانتان ﴿ولا تقتلوا انفسکم﴾ و لەناو یەکتردا جەنگ و ئاژاوە مەکەن و، بەناهەق و ناڕەواش یەکتری مەکوژن، وە یان خۆتان مەکوژن ﴿إن الله کان بکم رحیما﴾ چونکە بەراستیی خوا دەربارەی هەمووتان دلۆڤان و میهرەبانە کوشتنی خۆو مرۆڤ بەناهەق یاساغ کردووە ﴿[30] و من یفعل ذلك عدوانا و ظلما﴾ هەرکەسێکیش کاری نارەوای وابکات بەنیازی دوژمنایەتی و ستەم کردنەوە ﴿فسوف نصلیه نارا﴾ لەئاییندەدا دەیخەینە ناو ئاگرێکی گەورەوە تا بسووتێ و سزا بچێژێ ﴿وکان ذلك علی الله یسیرا﴾ ئەوەش بۆخوا زۆر ئاسانە ﴿[31] إن تجتنبوا کبائر ما تنهون عنه﴾ ئەگەر ئێوە لەو تاوانە گەورانە خۆ دووربگرن ﴿نکفر عنکم سیآتکم﴾ ئێمەش لەهەڵەو پەڵەتان دەبوورین ﴿وندخلکم مدخلا کریما﴾ دەتانبەینە جێگایەکی بەقەدرو عیزەت بەهەشتتان دەدەینێ.

**چاو مەبڕنە ماڵی یەکتر:**

ئیمامی (ئەحمەد) لە (موجاهید)ـەوە ئەگێڕێتەوە: کە (ئوم سەلەمە –خوای لێی رازی بێت) وتی: ئەی پەیامبەری خوا! ﷺ پیاوان دەچنە گۆڕەپانی جیهادەوە ژنان ناچن، لەمیراتیشدا دووئەوەندەی ژنان دەبەن! ئینجا خوای گەورە فەرمووی: ﴿[32] ولا تتمنوا ما فضل الله به بعضکم علی بعض﴾ نابێ ئاوات بۆ شتێ بخوازن کەخوا فەزڵ و ڕێزی هەندێکتانی بەسەر هەندێکا داوە، واتە: ئەگەر کەسێك داراییەکی یا هەرشتێکی تری پێدرابێ، هەرگیز ئێوە چاوی تێ مەبڕن و حەسوودی پێ مەبەن ﴿للرجال نصیب مما اکتسبوا﴾ چونکە پیاوان پاداشت و مافیان بەپێی هەوڵ و کۆششی خۆیان ﴿وللنساء نصیب مما اکتسبن﴾ ئافرەتانیش لەبەرامبەر کردەوەیان ماف و بەشی خۆیان هەیە کەوابوو با هەمووکەسێك تێبکۆشێ و ئیرەیی بەیەکتر نەبەن ﴿واسئلوالله من فضله﴾ ئێوە دەبێ هەمیشە لەخوا داوای ڕۆزیی و چاکە بکەن، چونکە هەر ئەودەهندەو بەخشندەیە ﴿إن الله کان بکل شئ علیما﴾ لەبەرئەوە کەخوا بۆخۆی بەهەموو شتێك زانایەو چاك دەزانێ، کە بەرژەوەندی هەریەکە لەبەندەکانی خۆی لەچیدایە، بۆیە لەبەشی هەریەکەیاندا فەرق وتەفاوت هەیە ﴿[33] ولکل جعلنا موالی﴾ بۆهەرمیراتبەرێك چەند کەسێکمان داناوە بەمیراتگر ﴿مما ترك الوالدان والأقربون﴾ کە لەومیراتەی باوك و دایك وخزمی نزیك بەجێیان هێشتووە میرات بگرن، وە دەبێ بەدادپەروەریش دابەشی بکەن ﴿والذین عقدت ایمانکم﴾ ئەوکەسانەش کە پەیمانتان لەگەڵ بەستوون هەرکات مردن و ماڵێکیان لەدوا بەجێما، لەسەردەمی نەفامییدا دەیانگوت: ئەگەر خوێنی بکەوێتە سەرم، دەبێ ئێوە خوێنم بۆ بدەن، ئەگەر منیش مردم ئێوە میراتم لێ ببەن ﴿فآتوهم نصیبهم﴾ دەبێ ئێوە مافی خۆیانیان پێ بگەیەنن هاوکارییان بکەن و خیانەت لەیەکتر نەکەن، بەڵێ: ئەمە لەناویاندا باوبوو هەتا خوای گەورە بەئایەتی (واولوا الأرحام بعضهم أولی ببعض) لەسوورەتی (ئەنفال) ئەوکارەی هەڵوەشاندەوەو میراتی

بردەوە سەر بنچینەی مردووەکە ﴿إن الله كان على كل شيء شهيدا﴾ بەراستیی خوا بەسەر هەموو شتێکا هەمیشە ئامادەو ئاگادارە، هەر بەپێی ئەوەیش کە ئەوخەڵکە کردویانە تۆڵەو پاداش ئەداتەوە.

**ڕێنماییەکانی ئایەتی (٣٢-٣٣):**

**١- ئارەزوو خواستن بۆماڵ و سامان و کارنەکردن بۆ پەیداکردنی، شتێکی دزێوو نەشیاوە.**

**٢- ئێرەیی و حەسوودی بردن بەم وبەو کارێکی حەرامە.**

**٣- هاوارو دوعا لای خوای میهرەبان هۆیەکن بۆ جێبەجێ بوونی مەبەستەکان.**

**٤- دامەزرانی یاسای میرات بردن لەیەکتریی و پەیمان بەستنی برایەتی، دەبێ مافی خۆی بدرێتێ، بەڵام هەقی میرات بردنی نییە.**

**٥- دەبێ هەمیشە چاودێریی و بەئاگایی خوا ڕەچاو بکرێ.**

سُورَةُ النِّسَاءِ — الجزء الخامس

ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعۡضَهُمۡ
عَلَىٰ بَعۡضٖ وَبِمَآ أَنفَقُواْ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡۚ فَٱلصَّٰلِحَٰتُ
قَٰنِتَٰتٌ حَٰفِظَٰتٞ لِّلۡغَيۡبِ بِمَا حَفِظَ ٱللَّهُۚ وَٱلَّٰتِي تَخَافُونَ
نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَٱهۡجُرُوهُنَّ فِي ٱلۡمَضَاجِعِ
وَٱضۡرِبُوهُنَّۖ فَإِنۡ أَطَعۡنَكُمۡ فَلَا تَبۡغُواْ عَلَيۡهِنَّ سَبِيلًاۗ
إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيّٗا كَبِيرٗا ﴿٣٤﴾ وَإِنۡ خِفۡتُمۡ شِقَاقَ
بَيۡنِهِمَا فَٱبۡعَثُواْ حَكَمٗا مِّنۡ أَهۡلِهِۦ وَحَكَمٗا مِّنۡ أَهۡلِهَآ إِن
يُرِيدَآ إِصۡلَٰحٗا يُوَفِّقِ ٱللَّهُ بَيۡنَهُمَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرٗا
﴿٣٥﴾ ۞ وَٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗاۖ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ
إِحۡسَٰنٗا وَبِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡجَارِ
ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡجَارِ ٱلۡجُنُبِ وَٱلصَّاحِبِ بِٱلۡجَنۢبِ
وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ وَمَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن
كَانَ مُخۡتَالٗا فَخُورًا ﴿٣٦﴾ ٱلَّذِينَ يَبۡخَلُونَ وَيَأۡمُرُونَ
ٱلنَّاسَ بِٱلۡبُخۡلِ وَيَكۡتُمُونَ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ
مِن فَضۡلِهِۦۗ وَأَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٗا مُّهِينٗا ﴿٣٧﴾

٨٤ — وَٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ

**دەسەڵاتی پیاوان بەسەر ژناندا (قەووامە):**

﴿[٣٤] الرجال قوامون على النساء﴾ پیاوان مافی بەڕێوەبەرێتیان بەسەر ژنانەوە هەیەو، دەتوانن چاودێرییان بکەن، ژنانیش دەبێ بەپێی پلان و نەخشەی ئەوان ڕەفتار بکەن.

**لێرەدا پێویستە کورتە باسێك دەربارەی (قەووامە) و دەسەڵاتی پیاوان بەسەر ژناندا بنووسین:**

وا ئەزانم ئەم مافی چاودێری و کاربەدەستیەی پیاوان بەسەر ژنانەوە، سەردڵی زۆرێك لەعەلمانیەکانی گرتووەو زۆریش پێیان قورسەو بۆیان قبوڵ ناکرێ! بەتایبەت ئەوانەیان وا ئەیانەوێ خۆیان لای ژنان خۆشەویست کەن و، ڕۆژ تا ئێوارە گریەیان بۆدەکەن، بۆیەش هەرئەوانە بێ سنوور ژنانیان بەرەڵڵا کردوو ناردنیانە سەنگەری دژی مێردەکانیانەوەو بەڵێنیان پێداون کە بەیەك وشەیش گوێرایەڵی نەکەن!! عەلمانییەکان بەوجۆرە ئەوخەڵکە دیندارەیش کە بەوردی یاسای (قەووامە)یان وەرنەگرتوە، ئەمەیان بەهەل قۆستەوەو لای زۆربەیان ژن بووە بەکۆیلەو دەبێ هەمووشتێکی ژنان هەر بەدەستی ئەوان بێت! ئەگەرچی جەنابیشی هیچی لێ نەزانێت..! جا لەبەرئەمە لەم جێگایەدا بەکورتەیەك دەڵێین: (قەووامە) مانای ژن بەکۆیلەو بەبەندەکردنی نییە بۆ پیاوان وەك ئەوانە لێی تێگەشتوون بەڵکو ئاراستەو ڕێنماییەکی خواییە بۆشێوەی کارو ڕەفتاری پیاوان لەگەڵ ژناندا، (تەوجیە)ی خواییە بۆیان کە دەبێ زۆر بەچاوی ڕێزەوە ئەو سپاردەو ئەمانەتە خواییە، لەچاویان باشتر بپارێزن، مافیان دابین بکەن لەخانوو جلوبەرگ و خواردن وخۆراك و پەروەردەو هۆشیارکردنەوەی لە گیروگرفت و ڕووداوەکانی گێتییان بۆ مسوٚگەر بکەن، وە لە سەرماو گەرماو برسیەتی و تینویەتی بیانپارێزن ، هیچ کات بێ نازیان نەکەن، کەمتر نەبن لەژنانی هاوشانی سەردەمی خۆیان، پیاوان ناهێڵن

هەست بەنەبوونی وموحتاجی بکەن، هەربۆیە لەکاتی بیْ (نەفەقە)ییدا دەسەڵات بەژن دراوە دەست لەپیاوەکەی هەڵبگریْ، وەیان بەکورتتر بڵێین: ئەو پلەو دەسەڵات و پایە کە بەپیاوان دراوە، بەرپرس بوون و ئەرك لە سەرشان نانە (مؤلیة التكلیف)ە، نەك بەزیاتر دانانی پیاوانە بەسەر ژناندا (تەفزیل)و (تەشریف) گومانیش نییە بۆپیاوان، کە هەر خێزانەی دەبیْ بەڕێوەبەرو چاودێرێکی هەبیْ، بۆئەوەی ئیش وکارەکانی بەرێکی جێبەجیْ ببن تا نەبێتە (فەوزا)و کێبەرکیْ، وایش ئەزانم پاش هەموو لێکدانەوەیەك ئەوجار پیاوان ئەو (تکلیف)ە کراون. خوشکانی بەڕێز! ئەگەر ژیان هەر بریتی بێت لەوە کەلە دەزگایەکی دەوڵەتیدا ببیتە کارمەند، پاشان بەسەیارە بێیت و بڕۆیت و سەری هەموومانگێك پارەیەکی باش بخەیتە گیرفانتەوە، ئەوە لەوحاڵەتەدا نەك هەرپیاوان بەڵکو تۆیش دەتوانی (قەووامە) و ئەرکەکانی ناو خێزان بەدەست بگری.. بەڵام خۆ ئاشکرایە کەنان پەیداکردن هەروەك لەدەزگایەکی دەوڵەتدا دەبێت خۆدیارە ئەمەیش ڕێژەیەکی کەمە لەنێو ژناندا چونکە بەشێکی زۆریان بەبازرگانیی و، پیشەسازیی و، کشتوکاڵ و، گێرەوکێشە و، هەزاران جۆری تری ژیانی لادیْ و گوندنشینەکانیشەوە خەریکن، دڵنیام لەوکاتەدا هەرگیز تۆ بەو (قەووامە)یە ڕازی نابیت ئەگەرچی زۆریشت لێبکەن، بەڵکو خۆت بەناسك ونۆڵ دادەنێیت و، پیاویش بەمرۆڤێکی جەستە بەهێزو زەبر، دەڵێیت هەقی پیاوە هەڵسیْ بەئیش وکاری مەزراو کشتوکاڵ.. هتد. ئومێدەوارم چ عەلمانیی چ ئیسلامیی لەم مەسەلەدا زیادەڕەوی نەکەن و پڕبەپڕ مافی خۆی بدەنیْ ﴿بما فضل الله بعضهم على بعض﴾ ئەم (قەووام)ەیش بۆیە دەدریْ بەپیاوان، چونکە خوای گەورە فەزڵی هەندێکیانی داوە بەسەر هەندێکدا، چونکە پیاوان جەستەو لاشەیان توندوتۆڵترو بەهێزترە لەژنان و، لەگەڵ کارەکانیشدا شیاوو گونجاوترن وە هەروەها.. ﴿وبما انفقوامن اموالهم﴾ سەرەڕای ئەوەش پیاوان ئەرکی ماڵ و دارایی بەخت کردنیان بۆ بەڕێوەچوونی ماڵ لەسەرە، دەبیْ مارەیی و ئازووقە بدەن بە ژنان ﴿فالصالحات قانتات﴾ جا ژنانی ژیرو چاك و پاك ئەوانەن کەملکەچی فەرمانی مێردەکانیان بن ﴿حافظات للغیب﴾ دوور لەشوویان شەرمی خۆیان دەپارێزن و گزییان لێی ناکەن، بەتایبەت کاتیْ کە مێرد دیارنەبێت هەرگیز ناتوانن خیانەتی لێبکەن ﴿بما حفظ الله﴾ وەك خوا فەرمانی داوە گوێڕایەڵ دەبن ﴿واللاتي تخافون نشوزهن﴾ ئەو ژنانەش ئێوە لەسەرپێچی و مل نەدانیان دەترسن. لەم ئایەتەدا تەنها باسی (نشوز)و سەرپێچی ژنان ڕادەگەیەنێت، بەڵام هەر لەم سوورەتی (النساء: ١٢٨)دا هاتووە: (وإن امرأة خافت من بعلها نشوزا أوإعراضا) کە دان بەسەرپێچی و مل نەدانی پیاوانیشدا دەنێت و دیارە کە ئەوانیش لاساریی و (نشوز)یان بەرامبەر ژنان دەبێت ﴿فعظوهن﴾ جالەوحاڵەدا بۆیەکەمجار: ئامۆژگارییان کەن و، لەخوا بیانترسێنن ﴿واهجروهن في المضاجع﴾ بۆدووەم جار: ئەگەر ئامۆژگاری بێهودە بوو، جیْ خەویان بۆماوەیەك لیْ جیاکەنەوە ﴿واضربوهن﴾ بۆ سێیەم جار: ئەگەر بەوەیش ڕاست نەبوونەوە، گەر لێشیان بدەن و تەمێیان کەن دەبیْ، بەڵام بەلێدانێکی سووك و بریندارییان نەکەن و لەدەم و چاویان نەدریْ و ئاسەواری بەجیْ بمێنیْ. لەفەرموودەی صەحیحدا هاتووە: ((واتقواالله في النساء، فإنهن عندکم عوان ولکم علیهن ألا یوطئن فرشکم أحداتکرهونه، فإن فعلن فاضربوهن ضربا غیر مبرح، ولهن علیکم رزقهن و کسوتهن بالمعروف))، موسلیم کتاب الحج ٨٨٩/٨٩٠، زانایان یەك دەنگن لەوەدا کەنابیْ بەولێدانە ئێش وئازاریان پێبگا، لەفەرموودەیەکی دیکەدا هاتووە: ((لا تضربوا إماء الله)) ئەبووداوود، نەسائی. ﴿فإن اطعنکم فلا تبغوا علیهن سبیلا﴾ ئینجا ئەگەر بەم هۆیانە لەیاخی بوون و ملنەدان وازیان هێناو گوێڕایەڵیْ بوون، ئیتر ئێوەش هیچ ڕێگەیەکی تر مەگرنەبەر بۆئازاردانیان وستەم

لێکردنیان ﴿إن الله كان عليا كبيرا﴾ بەڕاستیی خوا جێ بەرزو بڵندە، گەورەو زانایە، هەرکەسێك دەستدرێژی بکات، تۆڵەی لێ ئەسێنێ.

**ئەر ژن و پیاو پێکەوە هەڵیان نەکرد، لە هەردوولا (کەیخوا) بگرن:**

﴿[35] وإن خفتم شقاق بينهما﴾ خۆئەگەر ترستان لەبشێوی و ناکۆکی ژن و مێرد هەبوو، دەتانزانی پێکەوە هەڵناکەن ﴿فابعثوا حكما من أهله وحكما من أهلها﴾ جا کەسێکی دادوەر لەخزم و بنەماڵەی مێردەکەو، دادوەرێکیش لەخزم و کەس و کاری ژنەکە بنێرن بۆدۆزینەوەی هەڵەکانیان و، ئەوسا دانانی چارەسەرێك بە هەرجۆرێك کەئەوان بەچاکیان دەزانی ﴿إن يريدا إصلاحا يوفق الله بينهما﴾ ئەگەر هەردووك رازی بوون پێك بێنەوەو نیەتیان پاك بوو ئەوا خواش یەکیان ئەخات وپێکیان دێنێتەوەو پیرۆزی ئەخاتە کارەکانیانەوە ﴿إن الله كان عليما خبيرا﴾ بەڕاستیی خوا بەردەوام زانایە بەئەحواڵی گشت کەسێ، ئاگادارە بە بەرژەوەندیی بەندەکانی.

رێنمایەکانی ئایەتی (٣٤-٣٥):

١- چەسپاندنی سەرپەرستیاریی و (قەووامە)ی پیاوان بەسەر ژنانەوە.

٢- رێزو قەدر لێنان لەژنە صالحەکان، چارەسەری نافەرمانیی و مل نەدانی ژنان (نشوز).

٣- برووبیانو دۆزینەوە بۆ لێدان و ئازاردانی ژنان حەرامە.

٤- فەرمان بە (تەحکیم) و ناوبژیکردن لەکاتی ناکۆکی نێوان ژن و مێردا بۆ دەرخستنی هۆی ناکۆکی و پێکەوە نەژیان و پاشان یەك بخرێنەوە، یان لێك جیا بکرێنەوە.

**بەندایەتی خوا بکەن و هیچ شتێ مەکەنە شەریکی:**

﴿[36] واعبدوا الله ولا تشركوا به شيئا﴾ ئەی خەڵکینە! تەنها خوا بپەرستن و هیچ شتێك مەکەنە هاوبەشی، نە مرۆڤ، نە دار، نە بەرد.. نە بتان ﴿وبالوالدين إحسانا﴾ و بەکاروکردەوەی چاك و شیرین لەگەڵ باوك ودایکتانا رەفتار بکەن، با هەمیشە قسەتان خۆش بێت لەتەکیان، کردارتان پاك و پەسەند بێت بەرامبەریان، رزق و رۆزیی و بژێوییان بدەنێ ﴿وبذي القربى﴾ وە دەربارەی خزمانی نزیك ﴿واليتامى والمساكين والجار ذي القربى والجار الجنب﴾ و هەتیوان و هەژاران و بێ نەوایان و دراوسێی دیوار بەدیوارو، دراوسێی دوورو بێگانە ﴿والصاحب بالجنب﴾ و هاوەڵ و هاوڕێی هەمیشەییتان، وەکو خێزان، هاوڕێی خوێندن، ئەوکەسەی بەهەمیشە لەلاتانە ﴿وابن السبيل﴾ وبەوانەی رێبوارو ئاوارەو نەناسراوو لەڕێ جێماون ﴿وما ملكت أيمانكم﴾ وئەوانەی بوونەتە ژێردەستەو بەندەو کەنیزەتان هەروا ئاکار چاك بن ﴿إن الله لا يحب من كان مختالا فخورا﴾ چونکە بەڕاستیی خوا ئەوانەی خۆش ناوێت لووت بەرزو دەعیەبازو خۆبەزلزانن، پێغەمبەریشمان موحەممەد ﷺ فەرموودە یەکی فەرمووە: گشت جۆرە دراوسێیەك دەگرێتەوە: ((خير الأصحاب عندالله خيرهم لصاحبه، و خير الجيران عندالله خيرهم لجاره)) مسند احمد، واتە: هاوەڵی چاك وباش لای خوا، ئەوکەسەیە لەگەڵ هاوەڵ وهاورێکەیدا باش بێت، دراوسێی چاك وباشیش لای خوا، ئەوەیە کە بۆدراوسێکەی چاك وباش بێت.

**رژدو چرووك مەبن و هانی ئەم و ئەویشی بۆ مەدەن:**

﴿[37] الذين يبخلون ويأمرون الناس بالبخل﴾ ئەوکەسانەش کە چرووکی و پیسکەیی دەکەنە پیشەی خۆیان و، هێمان فەرمانیش بەخەڵکی دەدەن بەچکووسی وچرووکی! ﴿ويكتمون ما آتاهم الله من فضله﴾ وە ئەوخەڵاتەیش خوا پێیداون لەماڵ و سامان و زانستیی، لەخەڵکی ئەشارنەوەو ناهێڵن هیچ کەسێ سوودی لێوەرگرێت، دیارە

کاری وا، پیشەی خوانەناسانە ﴿واعتدنا للكافرين عذابا مهينا﴾ ئێمەیش بۆ خوانەناسان و حاشاکەرانی نیعمەتەکانی خوا، بەتایبەتی بۆئەوانەیان چرووکیی و پیسکەیی ئەکەن سزایەکی ڕیسواکەرمان ئامادەکردووە ﴿٣٨﴾ والذين ينفقون أموالهم رئاء الناس﴾ ئەوکەسانەش کە بۆ ڕووبینی ماڵ ودارایییان بەخت ئەکەن واتە: مەبەستیان بەو بەخششە ڕەزامەندی خوا نییە.. ﴿ولايؤمنون بالله ولاباليوم الآخر﴾ دیارە بۆیە ئاوا دەکەن، چونکە بڕوای ڕاستەقینەیان نە بەخوا هەیە، نە بەڕۆژی دوایی، ئەگینا ڕەفتاری ئاوایان نەئەکردو شەیتانیشیان هاوڕێ نەئەبوو. ﴿ومن يكن الشيطان له قرينا﴾ و هەرکەسێکیش شەیتان هاوڵ و هاودەم و هاوڕێی بێت و ڕێی بۆ دابنێت ﴿فساء قرينا﴾ جا هاوڕێیەکی زۆر خراپی بۆخۆی گرتووە، بۆیە ئەوکارە ناشیاوو ناڕێکانەشی پێدەکات ﴿٣٩﴾ وماذا عليهم لو آمنوا بالله واليوم الآخر﴾ ئەوانە چ زیانێکیان تووش ئەبوو، ئەگەر بەڕێکی بڕوایان بەخواو بەڕۆژی دوایی هێنابا ﴿و انفقوا مما رزقهم الله﴾ و لەو ڕزق و ڕۆزییەش کەخوا پێی بەخشیون بەشێکیان بەخت کردبا، بێگومان ئەگەرئاوایان کردبا جگە لەسوودو قازانجی هەردوولا زیانێکیان نەدەکرد ﴿و كان الله بهم عليما﴾ و خواش هەمیشە بەکاروباری ئەوان زانایە، بەنیازونیەتیان ئاگادارە.

الجزء الخامس | سورة النساء

وَالَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ رِئَاءَ النَّاسِ وَلَا يُؤْمِنُونَ
بِاللَّهِ وَلَا بِالْيَوْمِ الْآخِرِ وَمَن يَكُنِ الشَّيْطَانُ لَهُ قَرِينًا فَسَاءَ
قَرِينًا ﴿٣٨﴾ وَمَاذَا عَلَيْهِمْ لَوْ آمَنُوا بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَأَنفَقُوا
مِمَّا رَزَقَهُمُ اللَّهُ وَكَانَ اللَّهُ بِهِمْ عَلِيمًا ﴿٣٩﴾ إِنَّ اللَّهَ لَا يَظْلِمُ
مِثْقَالَ ذَرَّةٍ وَإِن تَكُ حَسَنَةً يُضَاعِفْهَا وَيُؤْتِ مِن لَّدُنْهُ
أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٤٠﴾ فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ
وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰؤُلَاءِ شَهِيدًا ﴿٤١﴾ يَوْمَئِذٍ يَوَدُّ الَّذِينَ
كَفَرُوا وَعَصَوُا الرَّسُولَ لَوْ تُسَوَّىٰ بِهِمُ الْأَرْضُ وَلَا يَكْتُمُونَ
اللَّهَ حَدِيثًا ﴿٤٢﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَقْرَبُوا الصَّلَاةَ
وَأَنتُمْ سُكَارَىٰ حَتَّىٰ تَعْلَمُوا مَا تَقُولُونَ وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِي
سَبِيلٍ حَتَّىٰ تَغْتَسِلُوا وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰ أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوْ جَاءَ
أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ الْغَائِطِ أَوْ لَامَسْتُمُ النِّسَاءَ فَلَمْ تَجِدُوا مَاءً
فَتَيَمَّمُوا صَعِيدًا طَيِّبًا فَامْسَحُوا بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ إِنَّ
اللَّهَ كَانَ عَفُوًّا غَفُورًا ﴿٤٣﴾ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُوا نَصِيبًا مِّنَ
الْكِتَابِ يَشْتَرُونَ الضَّلَالَةَ وَيُرِيدُونَ أَن تَضِلُّوا السَّبِيلَ ﴿٤٤﴾

٨٥

## ڕێنمایەکانی ئایەتی (٣٦-٣٩):

١- دەست نیشان کردنی مافی (١٠) دەستە لەم ئایەتەداو فەرمان بەجێبەجێ کردنی وەکو: پەرستنی خوا بەتاك و تەنیاو، چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك و... هتد.

٢- دەعیە نواندن و خۆ بەزلزانین و خۆهەڵکێشان حەرامە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ لەم فەرموودەدا ئەفەرموێ: ((إن الله لا ينظر إلى من جر ثوبه خيلاء))، واتە: خوای کارزان بەچاوی میهرەبانییەوە تەماشای ئەوکەسانە ناکا کە بۆدەعیەو فیز جلوبەرگیان بەدوای خۆیاندا ڕادەکێشن.

٣- ڕژدیی و چرووکیی و، شاردنەوەی زانست و هەقیقەت قەدەغەیە، وەك دەفەرموێ: ((إياكم والشح، فإنه اهلك من كان قبلكم، أمرهم بالقطيعة فقطعوا، وأمرهم بالفجور ففجروا)) مسلم/ كتاب البر ٢/١٣٣، واتە: وریابن لەچرووکی و پیسکەیی، چونکە هەرپیسکەیی بوو خەڵکانی پێش ئێوەی لەناوبرد، پەیوەندییەکانی نێوان خزم و کەس و کاری هەڵوەشاند، کاری ناشیاوو خراپی پێکردن، لەڕیوایەتێکی تردا هاتووە: (حملوهم على أن سفكوا دماءهم واستحلوا محارمهم)، واتە: بۆ ڕشتنی خوێنی یەکتری و، حەڵاڵ کردنی حەرامەکانیان هانیدان. بەڵێ ڕییاو ڕوپامایی و ریابازی کارێکی ناشیرین و ناپەسەندن، هاودەم و هاوڕێکردنی بەدکاران وخراپکاران، کارێکی دزێو و ئابڕووبەرە.

**بەسەنگی وردیلەیەکیش ستەم لەکەس ناکرێ:**

﴿[٤٠] إن الله لا يظلم مثقال ذرة﴾ بێگومان خوا بەسەنگی بچووکترین گەردیلە (زەررە).. ستەم لەهیچ کەس ناکا ﴿و إن تك حسنة يضاعفها﴾ و ئەگەر بەئەندازەی گەردیلەیەك چاکە بوو، خوا بەرەکەتی بەسەردا دەڕێژێ و دووئەوەندە پاداشی ئەداتەوە ﴿و يؤت من لدنه أجرا عظيما﴾ و لای خۆی پاداشتێکی گەورەی پێدەبەخشێ ﴿[٤١] فكيف إذا جئنا من كل امة بشهيد﴾ ئەبێ حاڵی بێ باوەڕان ئەوڕۆژە چۆن بێ کەئێمە لەهەر گەلێك شایەتێك دێنین شایەتییان لەسەر بدات ﴿وجئنا بك على هؤلاء شهيدا﴾ تۆش دەکەینە شایەت ئەی پێغەمبەر ﷺ لەسەر هەموو ئەوانە؟ (عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پێی وتم: هەندێ قورئانم بۆبخوێنە، منیش وتم: چۆن بۆتی بخوێنم؟ خۆ قورئان بۆتۆ هاتووە، فەرمووی: بەڵێ ڕاستە بۆمن هاتووە، بەڵام پێم خۆشە لەغەیری خۆمەوە بیبیسم، جا منیش سوورەتی (نیساء)م بۆ خوێند، هەتا گەیشتمە ئەم ئایەتەی: (فكيف إذا جئنا..) فەرمووی: بەسە، پاشان دیتم هەردوو چاوی پڕبوون لەفرمێسك!. فتح الباری: ٧١٢/٨. ﴿[٤٢] يومئذ يودالذين كفروا و عصوا الرسول﴾ جا لەوڕۆژەدا ئەوانەی وا بێ باوەڕبوون و لەفەرمانی پەیامبەر سەرپێچیان کردووە ئەخوازن ﴿لو تسوى بهم الأرض﴾ کە لەگەڵ خاکدا یەکسان بوونایەو زیندو نەکرابانەوە ﴿ولا يكتمون الله حديثا﴾ دیارە ئەوڕۆژە ناتوانن هیچ قسەیەك لەخوا بشارنەوە، چونکە هەمووئەندامەکانی لەشیان شایەتیان لەسەر ئەدەن. بەڵێ لەم ئایەتەدا ڕوون نەکراوەتەوە ئاخو چۆن کردەوەکانیان دەخرێنەڕوو، بەڵام لەسوورەتی (یس٦٥)دا هاتووە: (اليوم نختم على أفواههم و تكلمنا أيديهم وتشهد أرجلهم بما كانوا يكسبون) ئەم ئایەتە ڕوونی کردۆتەوە کە هەرچەندە ململانێ و چەلەحانێ بکەن وبڵێن: (والله ربنا ماكنا مشركين) الأنعام/ ٢٣.. یان بڵێن: (ما كنا نعمل من سوء) النحل/ ٢٨. بێ کەڵکە و، هەر پێیان دەردەخرێ.

**ڕینمایەکانی ئایەتی (٤٠-٤٢):**

١- دادگەریی و لوتف و میهرەبانی خوا زۆر زۆرە!.

٢- پلە سەختەکانی ڕۆژی قیامەت، ئەوەندە قورسن کافران دەخوازن کە هەر گڵ بوونایە.

٣- گەورەیی و فەزیلەتی ئەم سوورەتی (نیساء)یە.

**بەلەش قورسیی و سەرخۆشی نزیکی نوێژ مەبنەوە:**

﴿[٤٣] ياأيهاالذين آمنوا لا تقربوا الصلاة وأنتم سكارى﴾ ئەی ئەوکەسانەی باوەڕتان هێناوە! لەکاتێکدا سەرخۆشن , نزیکی نوێژ مەکەونەوە، دیارە ئەم ئایەتە لەپێش یاساغکردنی شەراب و عەرەقەوە هاتۆتە خوارەوە, وە ئەمە یەکەم هەنگاوە دەهاوێژرێ بۆ حەرامکردنی شەراب, چونکە پاش ئەم ئایەتە بەدوو قۆناغی تر ئینجا بەیەکجاری حەرام دەکرێ ﴿حتى تعلموا ما تقولون﴾ هەتا دەزانن چی دەڵێن ! ئەوەتە لەباتی ئەوە لەنوێژەکانتاندا بڵێن: (قل ياأيها الكافرون لا أعبد ما تعبدون)، دەڵێن: (قل ياأيها الكافرون، أعبد ما تعبدون). ﴿ولا جنبا إلا عابرى سبيل حتى تغتسلوا﴾ وە لەکاتی لەشگرانیدا -تاخۆتان ئەشۆن- نزیکی مزگەوت مەبنەوە, مەگەر ڕێبوار بن و لەسەفەردابن،. جائەگەر ڕێبوار بوون و ئاویش نەبوو و لەشیشتان بێ نوێژ بوو، لەباتی خۆشتن تەیەمموم بکەن, ئەوجا نوێژەکەتان بکەن، وەك دەفەرموێ: ﴿وإن كنتم مرضى او على سفر﴾ خۆئەگەر نەخۆش بوون، یا لەسەفەردا بوون ﴿او جاء أحد منكم من الغائط﴾ یان یەکێکتان لەسەر پێش ئاو هاتەوە ﴿او لامستم النساء﴾ یان تخوونی ژنەکانتان کەوتن.

زاناکان لەمانای ((أولامستم النساء)) دا ناکۆکن، بەلای ئەم بەڕێزانەوە: (عەلی کوڕی ئەبووتالیب و، ئوبەی کوڕی کەعب و، موجاهیدو، تاوس و، حەسەن و، عوبەیدی کوڕی جوبەیر) و هەندیکی تریش, لە(ئیبن عەباس)ـەوە دەگێڕنەوە: کەمەبەست پێی تێکەڵیکردنی ژن و پیاوە، کەوابوو: بەلێککەوتنی هەر ئەندامێکی ژن وپیاو لەیەکتر, دەستنوێژ ناشکێ، مەگەر سەرجێیی بکەن. ئیمامی (تەبەریی) یش لەتەفسیرکردنەوەیدا دەڵێ: ((أي عاشرتم النساء بالجماع)). واتە: لەگەڵ ژنانتاندا جووتبوون، ئەوکاتە دەستنوێژتان دەشکێ. بەڵگەیشیان ئەم فەرموودە صەحیحەیە کە دەڵێ: (أنه قبل بعض نسائه ثم صلى ولم يتوضأ) واتە: پێغەمبەر ﷺ بڕێ لەخێزانەکانی خۆی ماچ دەکردو، بێ دەسنوێژ گرتنەوەش نوێژی دەکرد. ((وقالت عائشة –رضي الله عنها–: كان رسول الله ﷺ يتوضأ ثم يقبل، ثم يصلي ولا يتوضأ)). خاتوو عایشە (خ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەستنوێژی دەگرت و وادەبوو یەکێ لەخێزانەکانی ماچ دەکردو، پاشان بێ دەسنوێژگرتنەوە نوێژی دەکرد. بەخاتووعائیشەیان گوت: دەبێ غەیرەز تۆ کێی ماچ کردبێت؟! ئەویش هاتە پێکەنین. (وحدث عروة عن عائشة: أن رسول الله ﷺ قبل بعض نسائه ثم خرج الى الصلاة ولم يتوضأ، قلت من هي إلا أنت؟ فضحكت) رواه أبوداود والترمذي وإبن ماجه. (بەندە) یش پاش لێکۆڵینەوەیەکی زۆر قەناعەتم هاتە سەر ئەم رایەی دواییە، خوایش بۆ خۆی زاناترەو چاکتر دەزانێ. خاوەنی (فی ظلال القرآن) –پاش هێنانی چوار ڕاوبۆچوونی لێك جیا– ئەڵێت: (والذى نرجحه فى معنى ((أو لامستم النساء)) أنه كناية عن الفعل الذى يستوجب الغسل، وبذلك نستغنى هنا عن كل الخلافات فى مسألة الوضوء). واتە: ئەوی پەسەند بێ بەلامانەوە لەمانای (أولامستم النساء..)دا ئەوەیە کە(کینایە)یە لەشتێکدا خۆشۆرین پێویست دەکات. ئێمەش هەر ئەم مانایەمان دەچێتە دڵەوە کەدەڵێ: مەبەست بە (لامستم النساء) تێکەڵی ژن و پیاوە. ئەڵبەت بێجگە لەوکۆمەڵە زانایانە, کۆمەڵە زانایەکی تر هەن کەدەڵێن: مەبەست پێی لەیەك کەوتنی پێستی ژن و پیاوە، نەك جیماع و تێکەڵی. ﴿فلم تجدوا ماء﴾ جا لەوحاڵەتانەدا هیچ ئاوێکتان دەست نەکەوت، بۆ دەستنوێژ، یان بۆ خۆ شۆرین ﴿فتيمموا صعيدا طيبا﴾ ئینجا گڵێکی پاك پەیدا بکەن ﴿فامسحوا بوجوهكم وأيديكم﴾ و بەدەم چاوو دەستەکانتانی بهێنن , لەباتی دەسنوێژو خۆشتن بەئاو ﴿إن الله كان عفواغفورا﴾ بەراستیی خوا زۆر لێبوردەیە, ڕێگەتان بۆئاسان ئەکات, زۆریش بپۆشە لەکاری هەڵەو نەزانین.

ڕێنماییەکانی ئایەتی (٤٣):

١- لەش قورس نابێ لەمزگەوتدا بمێنێتەوە، بەڵام دەتوانێ بەپەلە بەنێویدا تێپەڕێ, وە ناشتوانێ قورئان بخوێنێ، وەکو دەفەرموێ: ((لا يقرأ الجنب ولا الحائض شيئا من القرآن)) (ئیبن ماجە).

٢- لەشگران دەبێ بەئاو خۆی بشۆرێ، خۆئەگەر ئاونەبوو تەیەمموم بکاو ئینجا ئەگەر گڵ دەست نەکەوت بۆ تەیەمموم، – وەکو کۆمەڵە زانایەکی زۆر دەڵێت– بەهەمووشتێکی تر، (وەك بەرد، زیخ، لم..) دروست و ڕەوایە. چونکە عەرەبەکان لەمانای (صعيداً..)دا دەڵێن: (المراد بالصعيد هنا هو كل ما صعد على وجه الأرض ولم تدخله صنعة البشر كالتراب والحجر والرمل والشجر والنبات..).

**خاوەن نامەکان ڕێیان هەڵە کردو حوکمی خواشیان گۆڕی:**

﴿[٤٤] ألم تر إلى الذين أوتوا نصيبامن الكتاب﴾ ئاخۆ ئەوانەت نەدیوە ئەی پێغەمبەر! ﷺ کە بەشێك لە (تەورات)یان پێدراوە، واتە زاناکانیان ﴿يشترون الضلالة﴾ کەچی لەباتی هیدایەت و ڕێنمایی گومڕایی و ڕێی هەڵە بۆخۆ دەکڕن ﴿ويريدون أن تضلوا السبيل﴾ دەشیانەوێ ئێوەش وەك خۆیان ڕێگە هەڵە بکەن . لەسوورەتی (بەقەرە:

١٠٩)دا هاتووه: (ود كثير من أهل الكتاب لو يردونكم من بعد إيمانكم كفارا حسدا من عند أنفسهم) وه لەسوورەتی (آل عمران: ٦٩)دا هاتووه: (ودت طائفةمن أهل الكتاب لو يضلونكم وما يضلون إلا أنفسهم وما يشعرون). ﴿[٤٥] والله أعلم بأعدائكم﴾ وەخوای بەهەق لەخۆتان بەنیازو جموجوڵی دوژمنانتان زاناتره ﴿وكفى بالله وليا وكفى بالله نصيرا﴾ و تەنها خوای کارسازو یارمەتیدەرتان بەسه, دەسا ئێوەش تەنها هەربەو پشت ببەستن ﴿[٤٦] من الذين هادوا﴾ ئەو دوژمنانەتان برێكیان لەو جوولەکانەن ﴿يحرفون الكلم عن مواضعه﴾ كه گوتارو فەرمووده‌ی خوا لەجێی خۆی ئەگۆڕن و مەبەستەکانی هەڵ دەگێڕنەوه ﴿ويقولون سمعنا وعصينا﴾ وه بەکینەو گاڵتەشەوه بەتۆ دەڵێن: بیستمان و گوێشمان نەدا!! ﴿واسمع غير مسمع﴾ دەسا تۆیش گوێ بگره بۆمان، ئەی موحەممەد ﷺ یاخوا قەتیش نەبیسیت، واته: خوا کەڕوکاست بکا، یان بتمرێنێ ونەژییت ﴿وراعنا﴾ هەروەها لەکاتی قسەو وتووێژدا پێت دەڵێن: ((راعنا)) ئەم وشەیه لەزمانی عەرەبیدا بەواتای مۆڵەتمان بدەو پەلەمان لێمەکه هاتووه، بەڵام لەزمانی خۆیاندا مەبەستیان پێی جنێوو سووکایەتیی کردنه بەپێغەمبەرﷺ ﴿ليا بألسنتهم وطعنا في الدين﴾ لەبەر تانەوتەشەر دان و لاقرتیی بەدین کردن، زمانیان دەلاڵ دەگرن، هەتا بەوکردارەیان هەق و ناهەق تێکەڵ بکەن و ماناراستییەکەی بشارنەوه! ﴿ولو أنهم قالوا سمعنا وأطعنا﴾ خۆئەگەر لەباتی ئەوه گوتبایان: بیستمان و گوێڕایەڵێین بۆت ﴿واسمع وانظرنا﴾ وقسەمان ببیسەو، مۆڵەتمان بده تا تێدەگەین ﴿لكان خيرا لهم وأقوم﴾ دیاره ئەوه چاکترو راستتربوو بۆیان لای خوا ﴿ولكن لعنهم الله بكفرهم فلا يؤمنون إلا قليلا﴾ بەڵام بەهۆی سپڵەیی و بێ باوەڕییانەوه خوا نەفرینی لێکردن‌و، لەئەنجامیشدا کەمێکیان نەبێت باوەڕێکی ڕاست ناهێنن.

الجزء الخامس — سُورَةُ النِّسَاءِ

وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِأَعۡدَآئِكُمۡۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَلِيّٗا وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ نَصِيرٗا ﴿٤٥﴾
مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْ يُحَرِّفُونَ ٱلۡكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ وَيَقُولُونَ
سَمِعۡنَا وَعَصَيۡنَا وَٱسۡمَعۡ غَيۡرَ مُسۡمَعٖ وَرَٰعِنَا لَيَّۢا بِأَلۡسِنَتِهِمۡ
وَطَعۡنٗا فِي ٱلدِّينِۚ وَلَوۡ أَنَّهُمۡ قَالُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَا وَٱسۡمَعۡ وَٱنظُرۡنَا
لَكَانَ خَيۡرٗا لَّهُمۡ وَأَقۡوَمَ وَلَٰكِن لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفۡرِهِمۡ فَلَا يُؤۡمِنُونَ
إِلَّا قَلِيلٗا ﴿٤٦﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ ءَامِنُواْ بِمَا نَزَّلۡنَا
مُصَدِّقٗا لِّمَا مَعَكُم مِّن قَبۡلِ أَن نَّطۡمِسَ وُجُوهٗا فَنَرُدَّهَا
عَلَىٰٓ أَدۡبَارِهَآ أَوۡ نَلۡعَنَهُمۡ كَمَا لَعَنَّآ أَصۡحَٰبَ ٱلسَّبۡتِۚ وَكَانَ أَمۡرُ
ٱللَّهِ مَفۡعُولًا ﴿٤٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ
ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُۚ وَمَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفۡتَرَىٰٓ إِثۡمًا عَظِيمًا
﴿٤٨﴾ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يُزَكُّونَ أَنفُسَهُمۚ بَلِ ٱللَّهُ يُزَكِّي مَن يَشَآءُ
وَلَا يُظۡلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٤٩﴾ ٱنظُرۡ كَيۡفَ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَۖ
وَكَفَىٰ بِهِۦٓ إِثۡمٗا مُّبِينًا ﴿٥٠﴾ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُواْ نَصِيبٗا
مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡجِبۡتِ وَٱلطَّٰغُوتِ وَيَقُولُونَ
لِلَّذِينَ كَفَرُواْ هَٰٓؤُلَآءِ أَهۡدَىٰ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ سَبِيلًا ﴿٥١﴾

أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ — ٨٦

## ڕینمایەکانی ئایەتی (٤٤-٤٦):

١- لەبەرامبەر گزیی وفرت وفێڵی یەهوودەوه هەر لەسەردەمی پێغەمبەرەوه ﷺ تائەمڕۆ بۆ بڕواداران تەنیا خوا بەسه.

٢- دەرخستنی نیازو نیەتی بەدفەڕی جوولەکه بەرامبەر به پێغەمبەر ﷺ

٣- باوەڕی کەم ولاواز، ئاسەوارێکی چاك بۆخاوەنەکەی ناخاتەوه.

**ئەی خاوەن نامەکان! بەم قورئانەش باوەڕ بکەن:**

﴿[٤٧] ياأيهاالذين أوتوا الكتاب﴾ ئەی ئەوانەی لەپێشەوه کتێب و نامەتان پێدراوه ﴿آمنوا بما نزلنا﴾ باوەڕ بێنن بەم قورئانەی دامانبزاندوّته خوارەوه ﴿مصدقا لما معكم﴾ كه ددان دەنێ بەوکتێبەی ئێوەدا ﴿من قبل أن نطمس وجوها﴾ بەر لەوه چەند دەمو چاوێك ساف بکەین. شێوەی مرۆڤیان لێ داماڵین ﴿فنردها على أدبارها﴾ و وەکو

پشتی سەریانی لێبکەین، واتە ئیتر ڕێ دەرنەکەن و بەئامانج نەگەن ﴿او نلعنهم كما لعنا أصحاب السبت﴾ یاخود نەفرینیان لێبکەین، هەروەك چۆن نەفرینمان لەوانە کرد ڕۆژی شەممەیان شکاندو بوونە مەیمون، لەسوورەتی (بەقەرە:٦٥)دا: (ولقد علمتم الذين اعتدوا منكم فى السبت فقلنا لهم كونوا قردة خاسئين) وە لەسوورەتی (ئەعراف: ١٦٦)دا: (فلما عتوا عن ما نهوا عنه قلنا لهم كونوا قردة خاسئين) وە لەسوورەتی (مائیدە: ٦٠)دا: (..من لعنه الله وغضب عليه وجعل منهم القردة والخنازير) هاتووە بۆئەوە کە نەفرین لێیکردنە لێیان، شێواندنی ڕەنگ و ڕوخساریان بوو، دەم وچاویان وەکو پشتی سەریانی لێهات، نەلووت، نەبرۆ هیچی تێدا نەماو، وەکو داروبەردیان لێهات نەهەست و نەشعووریان نەما ﴿و كان امرالله مفعولا﴾ دیارەکە خوا فەرمان بەهەرچی بدا, هەمیشە وبەردەوام دێتەدی.

## بەتەوبە نەبێ خوا لەشیرك نابووری:

﴿[٤٨] إن الله لا يغفر ان يشرك به﴾ بێگومان هەرگیز خوا لەدانانی هاوبەش بۆی نابووری ﴿ويغفر ما دون ذلك لمن يشاء﴾ و لەخوار شیرکەوە لەهەر گوناهێك دەبووری بۆ هەرکەسێك خۆی بیەوێت ﴿ومن يشرك بالله فقد افترى إثما عظيما﴾ وەهەی کەسێك هاوبەش بۆخوا دابنێ, بەڕاستیی درۆو گوناهێکی گەورەی کردووە. بەڵێ لەچەند جێگایەکی تردا هاتووە: کەخوا کاتێ لە (مشرکان) خۆش نابێت کە لەو شیرکە پەشیمان نەبنەوەو لەسەری بمرن ئەگینا لێیان ئەبووری، وەك لەجێگایەکی تردا ئەفەرموێ: (إلا من تاب وآمن وعمل صالحا) (فورقان: ٧٠)، یان دەفەرموێ: (قل للذين كفروا إن ينتهوا يغفر لهم ما قد سلف) (ئەنفال: ٣). لە جێگایەکی تری هەمان سورەتی (نیسا ١١٦)دا دانانی شەریك بۆخوا , بەتەواوی هۆی دوورکەتنەوەیە لەڕەحمەتی خوا , وەکو دەفەرموێ (إن الله لايغفر أن يشرك به ويغفر ما دون ذلك لمن يشاء ومن يشر بالله فقد ضل ضلالا بعيدا) وە هەر لە قورئاندا هاتووە کە بەهەشت لەسەر موشریکان و هاوبەشدانەران حەرام و یاسەغە، وەك دەفەرموێ: (.. إنه من يشرك بالله فقد حرم الله عليه الجنة ومأواه النار..) (مائیدە:٧٢) یان دەفەرموێ: (ونادى أصحاب النار أصحاب الجنة أن أفيضوا علينا من الماء أو مما رزقكم الله قالوا إن الله حرمهما على الكافرين) (ئەعراف:٥٠) . لەجێگایەکی تریشدا ڕوونی دەکاتەوە کە هەرگیز موشریك لەئاگری دۆزەخ ڕزگاری نابێت، وەك دەفەرموێ: (ومن يشرك بالله فكأنما خرمن السماء فتخطفه الطير أو تهوى به الريح فى مكان سحيق) (حەج: ٣٠)وە هاتووە کە: ئەمن و ئاسایش و ڕێنمابوون تەنهابۆ ئەوکەسانەیە کە شیرکیان تێکەڵ بە ئیمانەکەیان نەکردووە وەك: (الذين آمنوا ولم يلبسوا إيمانهم بظلم أولئك لهم الأمن و هم مهتدون) (ئەنعام: ٨٢).

### ڕێنماییەکانی ئایەتی (٤٨):

١- هاوبەشدانان بۆ خوا وبێ باوەڕیی, لەزیندەبەچاڵکردن و هەمووتاوانێکی تر گەورەترە.

٢- هەموو نافەرمانییەك قابیلی بەخشینە، (شیرك)و (کوفر) نەبێ، ئەڵبەتە شیرك لق و پۆپی زۆرەو، لێرەدا لەبەر درێژبوونەوە بۆمان باس ناکرێ. ﴿[٤٩] الم تر إلى الذين يزكون انفسهم﴾ ئایا تەماشای ئەو جوولەکەو گاورانەت نەکردووە خۆیان دەپاڵێون و، پاکانە بۆ نەفس و دەروونی خۆیان ئەکەن و هەرخۆیان بەپیاوچاك دائەنێن و ئەڵێن: ((.. نحن ابناء الله وأحباؤه..)) واتە: هەر ئێمەین دۆست وخۆشەویستی خوا! ﴿بل الله يزكى من يشاء﴾ نەخێر، تەزکییە بەدەست ئەوان نییە، بەڵکو خوا حەزی لەهەرکەسێك بوو, ئەو بۆخۆی دەیپاڵێوێ و دڵ و دەروونی پاك دەکاتەوە, دیارە هەرکەسێك کە خوا خۆی پەسەندی بکاو تەزکیەی بکات، لێیشی خۆش ئەبێت. لەسوورەتی

(نەجم:٣٢)دا: (هو أعلم بكم إذ أنشأكم من الأرض وإذأنتم أجنة في بطون أمهاتكم فلا تزكوا أنفسكم هو أعلم بمن اتقى) هاتووەو دەڵێت: هەرگیز نابێت بێ باوەڕکان -بەتایبەتی خاوەننامەکان- پاکانە بۆخۆیان بکەن، لەسوورەتی: (مائیدە: ١٨): (نحن أبناء الله وأحباؤه) و لەسوورەتی (بەقەرە: ١١١): (وقالو لن یدخل الجنة إلا من كان هودا أو نصاری) هاتووە کەلەو دووجێگایەدا شێوەی خۆهەڵکیشان و تەزکییەکەیانی دیاریکردووە!! ﴿ولا یظلمون فتیلا﴾ و بەئەندازەی هەودای باریکی ناوکە خورمایەك ستەمیان لێناکرێ ، مەبەست بەبێژەی (فتیلا) مەسەلو نموونەیە بۆ گشت شتێکی کەمبایەخ و کەم وبچووك، واتە: تەنانەت لەشتی هەرەبچووکیش ستەم لەهیچ کەسێ ناکرێ ﴿٥٠ انظر کیف یفترون علی الله الکذب﴾ جا سەرنج بدە لەگەڵ ئەوهەموو تاوانانەیاندا چۆن درۆو قسە بەناوی خواوە هەڵدەبەسن و ئەڵێن: ئێمە نەوەیەکی بێ گوناح وپاکین، دۆستو خۆشەویست و نەوەی خواین ! ﴿وکفی به إثما مبینا﴾ وئەو درۆیەی بەسە وەکو گوناهێکی روون وئاشکرا بۆ خراپەکارییان. پاکانەو تەزکیە بۆ خۆکردن بەهەر مەبەستێك بێت کارێکی حەرامە، (عەمری کوڕی عەتا) ئەڵێ: کچێکمان هەبوو ناومان نا (بەڕڕە)، بەواتای چاكو چاك کار، هاوەڵان پێیان وتم کە پێغەمبەر ﷺ ڕێی لەوجۆرە ناوانە گرتووەو، فەرموویەتی: ((أتزکون أنفسکم، الله أعلم بأهل البر منکم)) پاشان ناوەکەیان گۆڕیو ناویان نا (زەینەب)، کەوابوو هەرجۆرە ناوێکی تر لەو بابەتە، بۆنموونە: (زکی الدین، محی الدین، بهاء الدین..) بەر ئەوحوکمە دەکەوێ، چونکە تەنیا خوا مافی تەزکیەی بۆهەیە لەنێو (ملأ الأعلی) و لەنێو خەڵکی زەویشدا. دادگەری لەپاداش و تۆڵەدا لەنێوان گشت مرۆڤەکاندا: (ولا یظلمون فتیلا).

**خاوەن نامەکان بتەکان و تاغووت دەکەنە حەکەم:**

(ئیبن عەباس) دەڵێ: (کەعبی کوڕی ئەشرەف) هاتە مەککە، قورەیش پێیانگوت: تۆ کە لەخاوەننامەکانی، ڕاتان بەرامبەر بە ئێمەو (موحەممەد) چییە؟ ئەوە ئێمە پەیوەندی خزمایەتیمان نەپچڕاندووە، وشتر ومالاّت سەردەبڕین بۆهەژاران، ئاوو شیر دەدەینە حاجییەکان..؟ (موحەممەد)یش کەسێکی وەجاخ کوێرەو، بۆتە مایەی لێکترازانی خزمان و، شوێنکەوتووەکانی !جا دەبێ ئەوچاك بێت, یان ئێمە ؟! (کەعب)یش گوتی: دیارە ئێوە لەخۆی و لەشوێنکەوتووەکانیشی باشترن، لەوەلاّمی ئەوقسەو باسەدا ئەم ئایەتە هات و فەرمووی: ﴿٥١ ألم تر إلی الذین أوتوا نصیبا من الکتاب﴾ ئاخۆ سەیری ئەوانەت نەکردووە کە بەشێك لەکتێبی (تەورات)یان پێدراوە؟ ﴿یؤمنون بالجبت والطاغوت﴾ کەچی باوەڕیان بەبت و، تاغووت و فاڵگرتنەوەو جادوو و شەیتان هەیە، واتە: پەیڕەوی لەبەرنامە دنیاییەکان دەکەن!! ﴿ویقولون للذین کفروا﴾ بەموشریك و بێ باوەڕەکان ئەڵێن: ﴿هؤلاء أهدی من الذین آمنوا سبیلا﴾ ڕێ و ڕێبازی ئەوانە (موشریك وکافرەکان) لەڕێی باوەڕدارەکان نمایان ترە ﴿٥٢ أولئك الذین لعنهم الله﴾ ئائەوانەن خوا نەفرینی لێکردوون و لەمیهرەبانی خۆی دووری خستوونەتەوە ﴿ومن یلعن الله فلن تجد له نصیرا﴾ دیارە هەرکەسێك خوا نەعلەت و نەفرینی لێبکات، هەرگیز تۆ هیچ یارمەتیدەرێکت بۆ دەست ناکەوێ ﴿٥٣ أم لهم نصیب من الملك﴾ ئاخۆ هیچ دەسەلاّتێکیان هەیە؟ تا بەئارەزووی خۆیان داوەری بکەن، بەشی ئەم بدەن و ئەو بێبەش بکەن ﴿فإذا لا یؤتون الناس نقیرا﴾ ئەگەر وابێ، ئەوەندە چرووکن بەئەندازەی تویکڵی پشتی دنکە خورمایەك بەشی کەس نادەن، واتە: ئەگەر دەسەلاّتی سامانی خەڵکیان هەبووبا هیچ شتێکیان بەش نەئەدان ﴿٥٤ أم یحسدون الناس علی ما آتاهم الله من فضله﴾ یان ئیرەیی و حەسادەت بەپێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی ئەبەن لەبەرئەوە کەخوا ئەوپلەو دەسەلاّتەی -لەفەزڵ ومیهرەبانی خۆی- پێداون؟ ﴿فقد آتینا آل إبراهیم الکتاب والحکمة﴾ جا بەڕاستی بەنەوەی ئیبراهیمی پەیامبەر عليه السلام -کە جوولەکەش بەرەی ئەون- کارزانی و پەیامی پەیامبەرایەتیمان

پێبەخشین ﴿و آتيناهم ملكا عظيما﴾ و دەسەڵاتێكی مەزن و گەورەشمان پێدان. دەسەڵاتەكەی (یوسف) و (داود) و
(سولەیمان –سلاوی لەسەربێ) بەناوبانگە دەسا ئیتر ئەوان بۆچی ئەوەندە حەسادەت بەموحەممەد ﷺ ئەبەن؟ ﴿(٥٥)
فمنهم من آمن به ومنهم من صد عنه﴾ ئینجا هەندێكیان باوەڕیان پێ هێناو، برێكیشیان ڕێیان لێگرت، ئیتر دەبێ
بەرامبەری تۆ چۆن بن؟ ﴿و كفى بجهنم سعيرا﴾ و ئاگری هەڵگیرساوی دۆزەخ بەسە لەبەرامبەر نكووڵییەكانیانەوە
﴿(٥٦) إن الذين كفروا بآياتنا﴾ بێگومان ئەوكەسانەی بەئایەت و نیشانەكانی ئێمە بێ باوەڕن ﴿سوف نصليهم نارا﴾
لەدوارۆژدا دەیانبەینە ناو ئاگرێكی بلێسەدارو گەرمەوە ئەیانبرژێنێ ﴿كلما نضجت جلودهم﴾ هەرجارەی كەپێستی
جەستەیان داپلۆخاو سووتا ﴿بدلناهم جلودا غيرها﴾ چەند پێستێكی تریان بۆئەگۆڕین لەجێی ئەودا ﴿ليذوقوا
العذاب﴾ تاپتر ئەوسزایە بچێژن. لەفەرموودەیەكدا هاتووە:
لەقیامەتدا جەستەی جەهەننەمییەكان گەورە ئەكرێت،
بەشێوەیەك كە نێوان نەرمایی گوێی هەریەكەیان بەئەندازەی
كێوی ئوحودی لێدێ. ئیمامی (ئەحمەد) ﴿إن الله كان عزيزا
حكيما﴾ بەڕاستیی خوا دەسەڵاتداری كاردروستە، هەرگیز
لەخۆوە سزای هیچ كەس نادات ﴿(٥٧) والذين آمنوا وعملوا
الصالحات﴾ ئەوكەسانەش كەباوەڕیان هێناوەو كارە
چاكەكانیان ئەنجام داوە ﴿سندخلهم جنات تجرى من تحتها
الأنهار﴾ بێگومان لەدوارۆژدا ئەیانبەینە ناو باخ و باخاتی
واوە، كە بەبن درەختەكانیدا كانی و ڕووبار دێت و دەڕوا
﴿خالدين فيها أبدا﴾ هەتا سەریش هەرلەوێ ئەمێننەوە ﴿لهم
فيها أزواج مطهرة﴾ ژنانی پاكوخاوێنیان دەدەینێ كە
لەهەمووشتێكی ناڕەواو قێزەون دوورن ﴿وندخلهم ظلا
ظليلا﴾ و دەشیان بەینە بن سێبەری چڕوپڕەوە، ئیتر لەوێ
نە سەرماو، نەگەرما، تینیان تێناكات. لەم ئایەتەدا سێبەری
بەهەشت بەوشەی (ظليل) هاتووە، وە لەجێگایەكی تردا بە
(دائم) هاتووە وەك: (أكلها دائم). وە لەسوورەتی (الواقعە:
٣٠)دا: هاتووە: (وظل ممدود). وە لەسوورەتی (المرسلات: ٤٠)دا: (إن المتقين في ظلال وعيون) هاتووە، واتە بەكۆ
هاتووە. وە لەسورەتی (یس: ٥٦)دا: (هم و أزواجهم في ظلال على الآرائك متكئون) هاتووە، بەواتای ئەوەكە:
بەهەشتی یەكان لەگەڵ ژن و هاوسەرەكانیان لەسەرتەختی ڕازاوەن و پێكەوە پاڵیان لێداوەتەوە، دیارە ئەم جۆرە
لێكدانەوەی جیاواز لەیەك فراوانی نازونیعمەتەكانی بەهەشت دەگەیەنێ. لەم فەرموودەیەشدا هاتووە: ((إن في
الجنة لشجرة يسير الراكب في ظلها مأة عام لا يقطعها، شجرة الخلد)) طەبەری: ٨/٤٩٢. لەبەهەشتدا درەختێكی
گەورەو نەبڕاوەی وا هەیە، سوارچاك سەد ساڵ بڕوا، ئەوسا هێمان بۆی نابڕێت.

سُورَةُ النِّسَاءِ — الجُزْءُ الخَامِسُ

أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُۖ وَمَن يَلۡعَنِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ نَصِيرًا ﴿٥٢﴾
أَمۡ لَهُمۡ نَصِيبٌ مِّنَ ٱلۡمُلۡكِ فَإِذٗا لَّا يُؤۡتُونَ ٱلنَّاسَ نَقِيرًا ﴿٥٣﴾ أَمۡ
يَحۡسُدُونَ ٱلنَّاسَ عَلَىٰ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦۖ فَقَدۡ ءَاتَيۡنَآ
ءَالَ إِبۡرَٰهِيمَ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَءَاتَيۡنَٰهُم مُّلۡكًا عَظِيمٗا ﴿٥٤﴾
فَمِنۡهُم مَّنۡ ءَامَنَ بِهِۦ وَمِنۡهُم مَّن صَدَّ عَنۡهُۚ وَكَفَىٰ بِجَهَنَّمَ سَعِيرًا
﴿٥٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِنَا سَوۡفَ نُصۡلِيهِمۡ نَارٗا كُلَّمَا نَضِجَتۡ
جُلُودُهُم بَدَّلۡنَٰهُمۡ جُلُودًا غَيۡرَهَا لِيَذُوقُواْ ٱلۡعَذَابَۗ إِنَّ ٱللَّهَ
كَانَ عَزِيزًا حَكِيمٗا ﴿٥٦﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ
سَنُدۡخِلُهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ
لَّهُمۡ فِيهَآ أَزۡوَٰجٞ مُّطَهَّرَةٞۖ وَنُدۡخِلُهُمۡ ظِلّٗا ظَلِيلًا ﴿٥٧﴾ ۞إِنَّ
ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا وَإِذَا حَكَمۡتُم بَيۡنَ
ٱلنَّاسِ أَن تَحۡكُمُواْ بِٱلۡعَدۡلِۚ إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعَۢا
بَصِيرٗا ﴿٥٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي
ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ
تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا ﴿٥٩﴾

الحزب ٩

٨٧

**هەرچی ئەمانەت بێ بیدەنەوە دەسی خاوەنەکەی:**

﴿^٥٨ إن الله يأمركم أن تؤدوا الأمانات إلى أهلها﴾ بێگومان خوا فەرمانتان پێدەدا کە هەموو ئەمانەت و سپاردەیەك بدەنەوە دەست خاوەنەکەی ﴿وإذا حكمتم بين الناس أن تحكموا بالعدل﴾ و هەرکات دادگایی نێوان مەردوم دەکەن, بە دادگەرانەو یەکسانیی داوەریی بکەن، واتە: بەلای هیچ کەسێکدا دامەبڕن, پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((إن الله مع الحاكم مالم يجر، فإذا جار و كله الله إلى نفسه)) ئیبن ماجە: ٧٧٥/٢, واتە: خوا پشتگیری لە(داوەر) دەکا هەتا ناهەقیی نەکا، هەرکە ناهەقییکرد, خوا وازی لێدێنێ و دەیداتە دەستی خۆی! ﴿إن الله نعما يعظكم به﴾ بەڕاستیی خوای بەهەق بەجوانترین شێوەو، بەشێوازێکی زۆر چاك ئامۆژگاریتان دەکات, کەوابوو ئێوە ئەو سپاردانەی لاتان بدەنەوە بەخاوەنەکانیان و، هەمووکاتیش بەدادگەرانە بڕیار بدەن ﴿إن الله كان سميعا بصيرا﴾ بێگومان خوا هەمیشە ژنەوایە بۆ گشت شتێ، بینایە بۆ دیارو نادیار. پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: ((إد الأمانة إلى من أئتمنك، ولا تخن من خانك)). پێشەوا ئەحمەد: ٤٠٤/٣. واتە: سوپاردە بدەوە دەستی خاوەن سپاردەکە، هەرگیز خەیانەت و گزی مەکەن, تەنانەتی لەگەڵ ئەوکەسەشدا خەیانەتی لێکردوویت.

**گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرو کار بەدەستانی خۆتان بن:**

﴿^٥٩ يا أيها الذين آمنوا اطيعوا الله واطيعوا الرسول﴾ ئەی ئەوکەسانەی باوەڕتان هێناوە! گوێڕایەڵیی فەرمانی خواو پەیامبەربن لەهەموو کاروبارێکدا ﴿وأولى الأمر منكم﴾ وە بەر فەرمانی کاربەدەستان و کارسازانی خۆتان بن، واتە: بەقسەی ئەو کاربەدەست و زانایانە بکەن، کە لەخۆتانبن. واتە: لەچوارچێوەی شەریعەتدا گوێڕایەڵیان بن ﴿فإن تنازعتم فی شئ﴾ ئینجا ئەگەر لەشتێکدا کێشەو ناکۆکیتان بوو ﴿فردوه إلى الله والرسول﴾ جا بیگێڕنەوە بۆلای خواو پەیامبەر ﷺ، واتە: باتەنها قورئان و سوننەت داوەرو حەکەمتان بن. بەڵێ پێویستە لەهەمووشتێکدا بگەڕێنەوە لای خواو پەیامبەر ﷺ, دیارە کەبڕیاری پەیامبەریش ﷺ هەر بڕیاری خوایە، وەك لەسوورەتی (نیساء: ٨٠)دا هاتووە: ﴿ومن يطع الرسول فقد اطاع الله﴾ کەوابوو نابێ بەهیچ جۆرێك کێشەکانتان بەرنە لای تاغووتەکانی سەردەم، وەك ئەفەرموێ: (ألم تر إلى الذين يزعمون أنهم آمنوا بما أنزل إليك و ما أنزل من قبلك يريدون أن يتحاكموا إلى الطاغوت وقد أمروا أن يكفروا به و يريد الشيطان أن يضلهم ضلالا بعيدا) ٦٠/٤. وە نابێ بەهیچ تاغووتێك باوەڕت هەبێ، ئەوجا دەبیتە موسڵمانی کامڵ و خاوەن باوەڕ, وەك لەسوورەتی (بەقەرە: ٢٥٦)دا هاتووە: (فمن يكفر بالطاغوت ويؤمن بالله فقد استمسك بالعروة الوثقى) ﴿إن كنتم تؤمنون بالله واليوم الآخر﴾ ئەگەر باوەڕتان بەخواو بەڕۆژی دوایی هەیە، دەبێ ئاوابێت ﴿ذلك خير و أحسن تأويلا﴾ ئەوگێڕانەوەی کێشەو هەرایە بۆلای قورئان و سوننەت، جوانترو چاکترە بۆتان، چاکترین ڕەفتاریشە بۆداهاتووتان.

**ڕێنماییەکانی ئایەتی (٥٨-٥٩):**

١- دەبێ هەموو سپاردەو ئەمانەتێ بپاریزرێ و، پاشان لەکاتی پێویستدا بدرێتەوە بەخاوەنەکەی ، ئەگەرچی خاوەنەکەی پیاو خراپ و موشریك و کافریش بێ.

**سەرنجێك:** ئەگەر بێ ئیهمالی و درێغیی ئەوکەسەی سپاردەکەی لایە، سپاردەکە تیاچوو، ناکەوێتە سەری وەکو پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((لا ضمان على المؤتمن)) رواه الدار القطني.

٢- دادگەریی و عەدالەت -بەتایبەتی لە(قەزاوەت)و داوەرییدا- فەرمانێکی خواییەو پێویستە جێبەجێ بکرێت، دەبێ ئیتاعەی خواو، پێغەمبەرو سەرپەرستیارانی موسڵمانان (واتە: زانایان و، فوقەها)کان بکرێ, هەر

**ئەمەیە (سەهلی کوڕی عبدالله) ئەڵێ: هەتا خەڵکی ڕێز لەسوڵتانی موسڵمانان و زانایانیان بگرن، هەمیشە لەخێردا ئەبن، خواش کاروباری دونیاو ئاخیرەتیان بۆ ساز ئەکا، خۆئەگەر سووکایەتیان پێبکەن، ئەوا بەرنامەی دونیاو دوارۆژیان لێ تێك ئەچێ.**

**٣- هەموو کێشەکان دەبێ بۆ چارەسەر بدرێنەوە دەستی قورئان و سوننەتی پێغەمبەر.**

**٤- بەختیاریی و سەرفرازیی دنیاو ئاخیرەت هەر بۆئەم ئوممەتەیە.**

**٥- رزگاری مرۆۋ لەوەدایە هەموو کارەکانی بەپێی کیتاب و سوننەت جێبەجێ بکا.**

## کێشە مەبەنە لای تاغووتەکان:

سُورَةُ النِّسَاءِ — الجزء الخامس

أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزۡعُمُونَ أَنَّهُمۡ ءَامَنُواْ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ
وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓاْ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ
وَقَدۡ أُمِرُوٓاْ أَن يَكۡفُرُواْ بِهِۦۖ وَيُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُضِلَّهُمۡ
ضَلَٰلَۢا بَعِيدٗا ٦٠ وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ تَعَالَوۡاْ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ
ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ رَأَيۡتَ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ يَصُدُّونَ عَنكَ
صُدُودٗا ٦١ فَكَيۡفَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةُۢ بِمَا
قَدَّمَتۡ أَيۡدِيهِمۡ ثُمَّ جَآءُوكَ يَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ إِنۡ أَرَدۡنَآ إِلَّآ
إِحۡسَٰنٗا وَتَوۡفِيقًا ٦٢ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَعۡلَمُ ٱللَّهُ مَا
فِي قُلُوبِهِمۡ فَأَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ وَعِظۡهُمۡ وَقُل لَّهُمۡ فِيٓ
أَنفُسِهِمۡ قَوۡلَۢا بَلِيغٗا ٦٣ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا
لِيُطَاعَ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ وَلَوۡ أَنَّهُمۡ إِذ ظَّلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ
جَآءُوكَ فَٱسۡتَغۡفَرُواْ ٱللَّهَ وَٱسۡتَغۡفَرَ لَهُمُ ٱلرَّسُولُ
لَوَجَدُواْ ٱللَّهَ تَوَّابٗا رَّحِيمٗا ٦٤ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ
حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيۡنَهُمۡ ثُمَّ لَا يَجِدُواْ
فِيٓ أَنفُسِهِمۡ حَرَجٗا مِّمَّا قَضَيۡتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسۡلِيمٗا ٦٥

وَلَوۡ أَنَّا كَتَبۡنَا — ٨٨

**پیاوێکی جوولەکەو یەکێکی دووڕوو کێشەیەکیان هەبوو، جا بۆچارەسەرەکەی جوولەکەکە وتی: بابچینە لای (موحەممەد) داوەرییمان بکا، کابرای دووڕووش وتی: نەخێر، بابچینە لای (کەعبی کوڕی ئەشرەف)ـی جوولەکە، ئینجا جوولەکەکە وتی: من دەڵێم بابچینە لای پەیامبەرەکەتان, کەچی تۆ بۆلای کەعبم دەبەیت؟! ئەوسا کابرای دووڕوو بەناچاری لەگەڵیا چوو بۆلای پەیامبەر ﷺ و دەرەنجام کێشەکە بەقازانجی جوولەکەکە برایەوە، ئەوسا موسڵمانە دووڕووەکە وتی: من بەبڕیاری (موحەممەد) رازی نیم، دەبێ بچینە لای (عومەری کوڕی خەتتاب) بەڵێ هەر کەرۆیشتنە لای عومەر، جوولەکەکە پێیگوت: ئەوە بزانە کە پێشتر رۆشتینە لای (موحەممەد)و بڕیاری بۆ مندا، کەچی وا ئێستا ئەم بەناو موسڵمانە قایل نابێ و هێناومی بۆلای تۆ، وتی: جا چۆن ئەم قسە وایە؟ وتی: بەڵێ. ئەوسا عومەر گوتی کەمێك چاوەروان بن هەر ئێستا داوەریتان ئەکەم. عومەر هەڵساو بەپەلە گەرایەوەماڵەوەو شمشێرەکەی خۆی هێناو دای لەملی موسڵمانە دووڕووەکەو، فەرمووی: هەرکەسێك رازی نەبێت بەحوکم و بڕیارەکانی خواو پەیامبەرەکەی ئابەوشێوەیە داوەریی دەکەم, ئیتر ئەم ئایەتە هات و فەرمووی: ﴿٦٠ الم تر إلى الذين يزعمون انهم آمنوا بما انزل إليك﴾ ئەرێ ئەوانەت نەدیوە را دەڵێن باوەڕیان بەو بەرنامەو قورئانەیە دابەزێنراوە بۆت هەیە ﴿وما انزل من قبلك﴾ و بەوپەیامەش پێش تۆ دابەزێنراوە باوەڕ دەکەن ﴿يريدون ان يتحاكموا إلى الطاغوت﴾ دەیانەوێ بۆ بڕینەوەی داواو کێشەکانیان بچنە لای تاغووت و بەرنامە شەیتانییەکان؟! ﴿وقد أمروا ان يكفروا به﴾ لەکاتێکدا فەرمانیان پێدرابوو بەوبەرنامە شەیتانیانە باوەڕ نەکەن و کارنەکەن ﴿ويريد الشيطان ان يضلهم ضلالا بعيدا﴾ و شەیتانیش دەیەوێ گومڕایان بکات بەگومڕا کردنێکی یەکجار دوورو بێ سنوور، بۆیە ئاوا سەر بۆ بەرنامە دنیاییەکان شۆڕ دەکەن!**

سەرنج: لەبەرئەوە هۆکاری هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتی (٦٠)ـە، سەعلەبی ریوایەتی کردووە، لاوازەو جێگەی تێبینییە ﴿[٦١] و إذا قیل لهم تعالوا إلى ما أنزل الله وإلى الرسول﴾ کاتێکیش بەو دووڕووانە بگوترێ: وەرنە لای ئەم بەرنامەو شەریعەتە خوا دایبەزاندووەو، وەرنە لای ئەم پەیامبەری خوایە، تا کێشەکەتان بۆ بڕێتەوە ﴿رأیت المنافقین یصدون عنك صدودا﴾ کەچی دووڕووەکان دەبینی بەتوندی رووت لێوەردەگێڕن و، قەتیش بەو بەرنامەو بڕیارەی تۆ رازی نابن! لەسوورەتی (منافیقون: ٥)یشدا هاتووە: (وإذا قیل لهم تعالوا یستغفر لكم رسول الله لووا رؤسهم ورأیتهم یصدون وهم مستكبرون) کە نەك تەنها بۆچارەسەری کێشەکانیان نایەنە لای پێغەمبەر ﷺ، بەڵکو ئەگەر بۆئەوەیش بێ کە پەیامبەر ﷺ داوای لێبوردنیان بۆبکات هەر مل بادەدەن و نایەن! ﴿[٦٢] فكیف إذا أصابتهم مصیبة بما قدمت أیدیهم﴾ جاکاتێ -بەهۆی ئەوکردەوە خراپەیانەوە وە بەرخۆیانیانداوە- نەهامەتییەکیان تووش دەبێ ﴿ثم جاوك یحلفون بالله﴾ پاشان بەهاوار هاوار دێنەلات و سوێند بەخوا دەخۆن ﴿إن أردنا إلا إحسانا وتوفیقا﴾ کە ئێمە لەبردنی کێشەو ئاژاوەکانمان بۆلای غەیری موحەممەد ﷺ تەنها چاکسازیی و بڕینەوەی کێشەو ئاژاوەکانمان مەبەست بووە، بەرژەوەندی وا داوایکردووە ﴿[٦٣] أولئك الذین یعلم الله ما فی قلوبهم﴾ ئائەوانە کەسانێکن خوا ئەزانێ چ مەبەست ونیازێك لەدڵیاندایە ﴿فأعرض عنهم﴾ جا تۆیش پشتگوێیان بخەو لێیانگەڕێ و پۆزشیان لێوەرمەگرە ﴿وعظهم﴾ و بەجوانیی ئامۆژگارییان بکە، بالەوە زیاتر درۆو دەلەسەو فڕوفێل نەکەن ﴿وقل لهم فی أنفسهم قولا بلیغا﴾ وە بەوتەیەکی جەرگبڕانە لەگەڵیان بدوێ، بەشێوەیەك کە هیچ قسەیان نەمێنێ و خۆ بدەن بەدەستەوەو لەدرۆو دەلەسە دەست هەڵبگرن.

رێنماییەکانی ئایەتی (٦٠-٦٣):

١- بردنی هەرکێشەیەك بۆلای غەیری قورئان و سوننەتی پێغەمبەر، کارێکی ناپەسەندو حەرامە. ملنەدان بەپیاوە (تاغووت)ەکان واجبێکی شەرعییەو دەبێ خەڵکیش بۆ بڕانەوەی کێشەکانیان هەر بۆلای قورئان و سووننەت بانگ بکرێن.

٢- خەڵکانی نەزان و نەفام دەبێ پشتگوێ بخرێن و، پۆزش و قسەیان لێوەرنەگیردرێ و، بە چڕوپڕیش ئامۆژگاری بکرێن، هەتا مل رادەکێشن.

**بەر فەرمانیی پێغەمبەر واجبە:**

﴿[٦٤] وما أرسلنا من رسول إلا لیطاع بإذن الله﴾ وە هەرکەسێکمان بە پەیامبەرێتی ناردبێت، تەنیا هەر بۆئەوە بووە کە دەبێ بەفەرمانی خوا گوێڕایەڵیی بکرێ، واتە: گشت پەیامبەران لەسەر بڕیاری خوا دەبێ بەگوێیان بکرێ، دیارە موحەممەدیش ﷺ یەکێ لەو پەیامبەرانەیەو، دەبێ گوێڕایەڵی بن ﴿ولو أنهم إذ ظلموا أنفسهم﴾ و ئەگەر ئەو دووڕوانە وەختێ ستەمیان لەخۆیانکرد، بەوە کێشەکانیان بردە لای تاغووتەکان ﴿جاؤك فاستغفروا الله﴾ هاتبنایە لای تۆئەی موحەممەد ﷺ! و داوای لێبوردنیان لەخوا کردبا ﴿واستغفر لهم الرسول﴾ و پەیامبەریش (واتە: تۆی پێغەمبەر) داوای لێبوردنت بۆ کردبان ﴿لوجدوا الله توابا رحیما﴾ بێگومان خوایان بە تەوبە وەرگرو میهرەبان دەست دەکەوت.

**تا شەرعی خوا نەکەنە بەرنامە، موسڵمان نین:**

﴿[٦٥] فلا وربك لا یؤمنون﴾ نەخێر وەك ئەوە نییە دووڕووەکان دەیزانن، سوێندبێ بەپەروەردگارت ئەی پێغەمبەر نابنە باوەڕدار ﴿حتى یحكموك فیما شجر بینهم﴾ تا بۆ یەکلاکردنەوەی کێشەکانی نێوانیان تۆ دەکەنە داوەر ﴿ثم لا

یجدوا فی انفسهم حرجا مما قضیت﴾ و ئەوساش بەرامبەر بەوبڕیارەی تۆ داوتە، هیچ تەنگیەکیان دەست نەکەوێ لەدەروونیاندا ﴿ویسلموا تسلیما﴾ و بەچاکیش تەسلیم و ملکەچ ببن. بەڵێ دەبێ ملکەچی و ڕەزامەندیی تەواومان بۆهەموو بڕیارەکانی خواو پەیامبەر ﷺ هەبێ، وەك لەسوورەتی (نوور:٥١)یشدا هاتووەو دەفەرموێ: (إنما كان قول المؤمنين إذا دعوا إلى الله ورسوله ليحكم بينهم أن يقولوا سمعنا و أطعنا..).

## ڕێنماییەکانی ئایەتی (٦٤-٦٥):

١- دەبێ گوێڕایەڵی لەهەموو (ئەمر)و (نەهی)یەکانی پێغەمبەر ﷺ بکرێ.

٢- هەموو گوناحێ گەورەو بچووك سنوور بەزاندن و ستەمەو دەبێ تەوبەی لێبکرێ.

٣- پێویستە بەهەموو بڕیارێکی خواو پێغەمبەر ﷺ ڕازی بین ﴿٦٦ ولوا ان کتبنا علیهم أن اقتلوا انفسکم﴾ گریمان ئەگەر ئێمە لەسەر ئەوانەمان نوسیبا کە دەچنە لای تاغووتەکان بۆ چارەسەری کێشەکانیان کە: دەبێ بۆ وەرگرتنی تەوبەو پەشیمانی لەوکارەیە یەکتر بکوژن وبچنە غەزا ﴿او اخرجوا من دیارکم﴾ یان دەبێ لەنیشتمانتان بچنە دەرێ لەبەرخوا، هەروەك بەجوولەکەکانی بەر لەئێوەمان گوت ﴿ما فعلوه إلا قلیل منهم﴾ زۆر کەمێکیان نەبێت، وەلامیان نەئەدایەوەو نەیان ئەکرد، بەلام خۆ خوای گەورە تەکلیفی لەتوانا بەدەرناکا ﴿ولو انهم فعلوا ما یوعظون به﴾ دیارە ئەگەر بەپێی ئامۆژگاریی و فەرمانەکانی خواو پەیامبەر ڕەفتاریان کردباو ئەم فەرمانەیان ئەنجامدابا ﴿لکان خیرا لهم واشد تثبیتا﴾ ئیتر بۆ دنیاو قیامەتیشیان چاك دەبووو باوەڕیشیان پتەوتر دەبوو ﴿٦٧ وإذا لأتیناهم من لدنا اجرا عظیما﴾ ئینجا ئێمەش بۆ خۆمان پاداشتێکی گەورەمان پێ دەبەخشین ﴿٦٨ و لهدیناهم صراطا مستقیما﴾ ئەوساش بەتەواوی ئەمانخستنە سەر ڕێگەی ڕاست و لەسەری دامەزراومان ئەکردن ﴿٦٩ ومن یطع الله والرسول﴾ و هەرکەسێکیش بەرفەرمانی خواو ئەم پەیامبەرە بێ ﴿فأولئك مع الذین انعم الله علیهم﴾ دەبێتە هاوڕێی ئەوکەسانە کەخوا چاکەو بەهرەی خۆی بەسەرا ڕشتوون، واتە: لەسەر ڕێگای ئەوان دەبن لەدنیاو لەدوارۆژدا ﴿من النبیین والصدیقین﴾ لەپەیامبەران و ڕاستگۆیان ﴿والشهداء والصالحین﴾ و شەهیدانی ڕێگەی خواو صالحان و کارچاکان ﴿وحسن أولئك رفیقا﴾ دیارە ئەمانە چ هاودەم و هاوڕێیەکی چاك و بێ وێنەن، دەسا هەرکەسێك پێی خۆشە کە لەقیامەتدا لەگەڵ ئەمانەدا بێت، دەبا خۆی بۆئامادە بکات بۆیە لەریوایەتێکی (مەرفوع)دا هاتووە: پیاوێك هاتەلای پەیامبەر ﷺ وتی: بێگومانبە، من تۆم لەخۆم و ماڵ و منداڵەکانم خۆشتر ئەوێ، کاتێکیش کە لەماڵەوەم هەر لەیادمی و، هەرگیز بێ تۆش ئۆقرە ناگرم، بەلام کە بیرم لەمردنی خۆم و تۆم کردەوە ئەوسا زانیم کە تۆ لەگەڵ پەیامبەران دەچیتە بەهەشت و جێگەی خۆت،

الجزء الخامس — سورة النساء

وَلَوْ أَنَّا كَتَبْنَا عَلَيْهِمْ أَنِ اقْتُلُوٓا أَنفُسَكُمْ أَوِ اخْرُجُوا مِن دِيَٰرِكُم مَّا فَعَلُوهُ إِلَّا قَلِيلٌ مِّنْهُمْ وَلَوْ أَنَّهُمْ فَعَلُوا مَا يُوعَظُونَ بِهِۦ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَأَشَدَّ تَثْبِيتًا ﴿٦٦﴾ وَإِذًا لَّأَتَيْنَٰهُم مِّن لَّدُنَّآ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٦٧﴾ وَلَهَدَيْنَٰهُمْ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا ﴿٦٨﴾ وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُولَٰٓئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّـۧنَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَآءِ وَالصَّٰلِحِينَ وَحَسُنَ أُولَٰٓئِكَ رَفِيقًا ﴿٦٩﴾ ذَٰلِكَ الْفَضْلُ مِنَ اللَّهِ وَكَفَىٰ بِاللَّهِ عَلِيمًا ﴿٧٠﴾ يَٰٓأَيُّهَا الَّذِينَ ءَامَنُوا خُذُوا حِذْرَكُمْ فَانفِرُوا ثُبَاتٍ أَوِ انفِرُوا جَمِيعًا ﴿٧١﴾ وَإِنَّ مِنكُمْ لَمَن لَّيُبَطِّئَنَّ فَإِنْ أَصَٰبَتْكُم مُّصِيبَةٌ قَالَ قَدْ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيَّ إِذْ لَمْ أَكُن مَّعَهُمْ شَهِيدًا ﴿٧٢﴾ وَلَئِنْ أَصَٰبَكُمْ فَضْلٌ مِّنَ اللَّهِ لَيَقُولَنَّ كَأَن لَّمْ تَكُنۢ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُۥ مَوَدَّةٌ يَٰلَيْتَنِى كُنتُ مَعَهُمْ فَأَفُوزَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧٣﴾ ۞ فَلْيُقَٰتِلْ فِى سَبِيلِ اللَّهِ الَّذِينَ يَشْرُونَ الْحَيَوٰةَ الدُّنْيَا بِالْءَاخِرَةِ وَمَن يُقَٰتِلْ فِى سَبِيلِ اللَّهِ فَيُقْتَلْ أَوْ يَغْلِبْ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٧٤﴾

٨٩

ترسم لێ نیشت كە جارێكی تر نەتبینمەوە! ئینجا ئایەتی: (ومن یطع الله والرسول) هاتە خوارەوە. (ئیبن كەسیر ئەمەی هێناوە ﴿٧٠ ذلك الفضل من الله﴾ ئەو قەدرو رێز لێنانە لەخواوەیەو. خوا خۆی ئەو حورمەتەی گرتوون ﴿وكفى بالله علیما﴾ و هەرخۆیشی (الله) بەسە كە بەهەمووشتێ دەزانێ و پاداش دەداتەوە.

## هەمیشە هۆشیار و ئامادە بن:

﴿٧١ یاایها الذین آمنوا خذوا حذركم﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! دەبێ هەمووكات وریابن و هۆشی خۆتانتان هەبێ و ئامادە بن بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمنانی دینی خوا ﴿فانفروا ثبات﴾ دەسا دەستە دەستە، تیپ تیپ، بچنە جیهاد ﴿او انفروا جمیعا﴾ وە یان هەمووتان پێكەوە بچنە غەزاو هەڵمەت بەرن بەپێی پێویست، مەبەست ئەوەیە كەهیچ كات گۆڕەپان چۆڵ نەبێ، ئەگینا موسڵمانان سوك و ریسوا ئەبن ﴿٧٢ وإن منكم لمن لیبطئن﴾ بێگومان دەستەیەك لەدوورِووەكانتان لەناودایە سستی دەكەن و خەڵكیش لەجیهاد سارد دەكەنەوە ﴿فإن اصابتكم مصیبة﴾ ئینجا ئەگەر ئێوە تووشی بەڵاو نەهامەتێك بوون، وەكو: كوشتن، یان تێكشكان لەگۆڕەپاندا ﴿قال قد انعم الله علی إذ لم اكن معهم شهیدا﴾ هەریەك لەو دووڕووانە ئەڵێت: بەراستیی خوا چاكەو بەهرەی گەورەی لەگەڵدا كردم كە لەگەڵ ئەوانەدا ئامادە نەبووم، هەتا منیش وەك ئەوان دووچار بوو بام ﴿٧٣ ولئن اصابكم فضل من الله﴾ خۆئەگەر لەفەزڵ و بەهرەی خواوە دەسكەوت و سەركەوتنێكتان بۆ بوو ﴿لیقولن كأن لم تكن بینكم و بینه مودة﴾ بەراشكاوی هەروەك كەسێك كەلەپێشدا هیچ پەیوەندیی و ئاشنایەتیەكتان نەبووبێت، دەڵێ: ﴿یا لیتنی كنت معهم فأفوز فوزا عظیما﴾ ئەی خۆزگایە! منیش لەگەڵیاندا بووبام، ئەوسا منیش لەو دەستكەوتە بەشدار دەبووم و بەئاواتێكی گەورە دەگەیشتم.

## هەر بۆ خوا بچنە غەزا:

﴿٧٤ فلیقاتل فی سبیل الله الذین یشرون الحیاة الدنیا بالآخرة﴾ دەسا بائەوانە جەنگ بكەن و بچنە غەزا كە لەبەرخوا دەیانەوێ دەس لەم ژیانی دنیایە هەڵگرن و، قیامەت بەدنیا بكڕن ﴿ومن یقاتل سبیل الله﴾ هەركەسەش دەچێتە غەزا لەپێناوی خوادا ﴿فیقتل﴾ چ بكوژرێت و شەهید بكرێ ﴿او یغلب فسوف نؤتیه اجرا عظیما﴾ یان زاڵ ببێ و سەركەوێ، ئێمە لەودنیا پاداشتێكی گەورەی پێئەبەخشین. بەڵێ موسڵمان چ بكوژرێ، یان زاڵ ببێ، هەر دووبارەكەی بۆئەو هەرسەركەوتن و پیرۆزییە، وەك لەسورەتی (التوبة: ٥٢)یشدا هاتووە: (قل هل تربصون بنا إلا إحدى الحسنیین).

## بۆ رزگاری خەڵكانی بێ هێزو ژنان و منداڵان جیهاد بكەن:

﴿٧٥ ومالكم لا تقاتلون فی سبیل الله﴾ ئەی ئیمانداران! ئێوە بەچ بەهانەو بیانوویەك ناچنە غەزا لەرێی خوا ﴿والمستضعفین من الرجال والنساء والولدان﴾ و لەبەر رزگاركردنی پیاوان و ژنان و منالانی لاوازو چەوساوەو بێ دیفاع ﴿الذین یقولون ربنا أخرجنامن هذه القریة الظالم اهلها﴾ ئەوانەی كە ئەڵێن: ئەی پەروەردگاری ئێمە! تۆ لەم شارەی (مەككەیە) كە دانیشتووەكانی ستەمكارن رزگارمانكە، چونكە ئازاری زۆرمان دەدەن و رێیشمان نادەن كۆچ بكەین ﴿واجعل لنا من لدنك ولیا﴾ دەسا لەلایەن خۆتەوە پشتیوان و كارسازێكمان بۆبەدی بێنە ﴿واجعل لنا من لدنك نصیرا﴾ و هەرلەلای خۆتەوە -بەفەزڵی خۆت- یارمەتیدەرێكمان بۆبەدی بێنە، پاشان خوای دلۆڤانیش بەهانایانەوە هات و پەیامبەری ﷺ بۆ ناردن و، مەككەی بۆ ئازاد كردن ﴿الذین آمنوا یقاتلون فی سبیل الله﴾ ئەوكەسانەی باوەڕیان هێناوە، لەرێی خوادا كوشتار دەكەن ﴿٧٦ والذین كفروا یقاتلون فی سبیل الطاغوت﴾ و

ئەوکەسانەش کافرو بێ باوەڕن, لەڕێگەی تاغووت و شەیتاندا کوشتار دەکەن ﴿فقاتلوا أولياء الشيطان﴾ دەسا ئێوە لەگەڵ دۆستان و یارانی شەیتاندا غەزا بکەن و بجەنگێن ﴿إن كيد الشيطان كان ضعيفا﴾ بێگومان پیلان و فڕوفێڵی شەیتان - لەچاو دەسەڵات و توانای خوادا- لاوازو بێ هێزە.

## ڕێنماییەکانی ئایەتی (٧٤-٧٦):

١- جیهادو جەنگ لەبەر دینی خواو بۆ ڕزگارکردنی خەڵکانی کزو بێ دەسەڵات و، هەڵوەشانەوەی دام و دەزگای لەخوا یاخییان فەرز کراوە.

٢- موجاهید دونیای خۆی دەدا بەپاشەڕۆژو قیامەت.

٣- موجاهید چ بکوژرێ و شەهیدببێ، یان بەغەنیمەت ودەستکەوتەوە بگەڕێتەوە، لەهەردووحاڵەتەکەدا سەرفرازو سەرکەوتووە.

٤- نابێ باوەڕداران لەترسی دوژمنانی دینی خوا دەست لەجیهاد هەڵبگرن، چونکە هێزی ئەوانە لەشەیتانەوەیەو، نەخشەی شەیتانیش هەرچەندە ببێ لاوازە.

### جیهاد فەرز کرا ، گوتیان بۆ غەزات لەسەر نووسین؟

هەندێ لەموسڵمانان کەهێمان لەمەککەدا بوون هاتنەلای پەیامبەر ﷺ وتیان: تائێمە هاوبەشمان بۆ خوا دائەناو موشریك بووین, سەربڵندو بێ ترس بووین، کەچی کە باوەڕمان هێنا، بوینە ژێردەستە و ترسنۆك بووین! دەسا مۆڵەتی جیهادمان بدە بابچین غەزایان بکەین؟ ئەویش ﷺ فەرمووی: من تائێستا تەنها بەچاوپۆشیی و لێبووردن فەرمانم پێکراوە، نە بەجەنگ. جا کە لەسەر داواکەی خۆیان جەنگ فەرز کرایە سەریان، ترسیان لێنیشت و خۆیان گرتە دواوە (أخرجه الحاكم فقال: رجاله رجال الصحيح).. ئینجا ئەم ئایەتە هات و فەرمووی: ﴿[٧٧] الم تر إلى الذين قيل لهم﴾ ئاخۆ سەیری ئەوانەت نەکرد پێیان گوترا: ﴿كفوا ايديكم واقيموا الصلاة واتوا الزكاة﴾ دەست لەجەنگ بگرنەوەو شەڕمەکەن، چونکە کاتی جەنگ نەهاتووە، وە لەباتی جیهاد نوێژەکانتان بکەن و زەکات بدەن، هەتا خوا مۆڵەت دەدات ﴿فلما كتب عليهم القتال﴾ جا کەچوونە مەدینەو جەنگ و جیهادیان لەسەر فەرز کرا ﴿إذا فريق منهم يخشون الناس كخشية الله﴾ یەکسەر دەستەیەکیان ئەوەندە لە ڕووبەڕووبوونەوەی خەڵکی ئەترسان، کە لەخواش هەرئەوەندە ئەترسان ﴿او اشد خشية﴾ یاخۆ زیاتریش دەترسان ﴿و قالوا ربنا لم كتبت علينا القتال﴾ و لەترسا گوتیان: ئەی پەروەردگارمان! بۆچی ئێستا جەنگت فەرز کردە سەرمان؟ ﴿لولا اخرتنا إلى اجل قريب﴾ خۆزگە تاماوەیەکی تر دوات خستبایەن، تا بەمردنی خۆمان دەمردین، نە بەکوشتن ﴿قل متاع الدنيا قليل﴾ ئەی پێغەمبەر ﷺ! بڵێ: ژیان و گوزەرانی ئەم دونیایە کەم و

---

سُورَةُ النِّسَاءِ — الجزء الخامس

وَمَا لَكُمْ لَا تُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ
وَٱلنِّسَآءِ وَٱلْوِلْدَٰنِ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا مِنْ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةِ
ٱلظَّالِمِ أَهْلُهَا وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ
نَصِيرًا (٧٥) ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟
يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱلطَّٰغُوتِ فَقَٰتِلُوٓا۟ أَوْلِيَآءَ ٱلشَّيْطَٰنِ ۖ إِنَّ كَيْدَ
ٱلشَّيْطَٰنِ كَانَ ضَعِيفًا (٧٦) أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ قِيلَ لَهُمْ كُفُّوٓا۟ أَيْدِيَكُمْ
وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقِتَالُ إِذَا فَرِيقٌ
مِّنْهُمْ يَخْشَوْنَ ٱلنَّاسَ كَخَشْيَةِ ٱللَّهِ أَوْ أَشَدَّ خَشْيَةً ۚ وَقَالُوا۟ رَبَّنَا لِمَ
كَتَبْتَ عَلَيْنَا ٱلْقِتَالَ لَوْلَآ أَخَّرْتَنَآ إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍ ۗ قُلْ مَتَٰعُ ٱلدُّنْيَا
قَلِيلٌ وَٱلْءَاخِرَةُ خَيْرٌ لِّمَنِ ٱتَّقَىٰ وَلَا تُظْلَمُونَ فَتِيلًا (٧٧) أَيْنَمَا
تَكُونُوا۟ يُدْرِككُّمُ ٱلْمَوْتُ وَلَوْ كُنتُمْ فِي بُرُوجٍ مُّشَيَّدَةٍ ۗ وَإِن تُصِبْهُمْ
حَسَنَةٌ يَقُولُوا۟ هَٰذِهِۦ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ۖ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَقُولُوا۟
هَٰذِهِۦ مِنْ عِندِكَ ۚ قُلْ كُلٌّ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ ۖ فَمَالِ هَٰٓؤُلَآءِ ٱلْقَوْمِ لَا يَكَادُونَ
يَفْقَهُونَ حَدِيثًا (٧٨) مَّآ أَصَابَكَ مِنْ حَسَنَةٍ فَمِنَ ٱللَّهِ ۖ وَمَآ أَصَابَكَ مِن
سَيِّئَةٍ فَمِن نَّفْسِكَ ۚ وَأَرْسَلْنَٰكَ لِلنَّاسِ رَسُولًا ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا (٧٩)

مَن يُطِعِ — ٩٠

کورته لەچاو قیامەتدا ﴿والآخرة خیر لمن اتقی﴾ ژیانی ئاخیرەت بۆئەوانەی لەخوا دەترسن زۆر باشترە لەم ژیانی دنیایە ﴿ولا تظلمون فتیلا﴾ و بەئەندازەی ئەو رەشتەیە لەناو قڵیشی ناوکە خورمادایە ستەمتان لێناکرێ، واتە: کەمترین ستەم لەکەس ناکرێ ﴿[78] أینما تکونوا یدرککم الموت﴾ دڵنیایشبن لە هەرجێگایەکدابن، مردن پێتان دەگات ، ئیتر خۆ لادان لە خەزا ئێوە رزگار ناکات لەمردن، جاکەوابوو بۆ چ لەجیهاد هەڵدێن؟ و خۆدەدزنەوە ﴿ولو کنتم فی بروج مشیدة﴾ ئەگەر لەناو کۆشك و قەڵای سەخت و قایمشدا بن هەر دەمرن، جاکەوابوو لەجەنگ رامەکەن ﴿وإن تصبهم حسنة یقولوا هذه من عندالله﴾ هەر خۆشیی وچاکەیەکیان بێتەرێ، دەڵێن ئەمە لەخواوەیە ﴿وإن تصیبهم سیئة﴾ خۆئەگەر ناخۆشیەکیان تووش بوو ﴿یقولوا هذه من عندك﴾ بەپێغەمبەر ﷺ ئەڵێن: ئەمە لەلایەن تۆوە بوو، واتە: نەهامەتی و شوومی تۆیە!! ﴿قل کل من عندالله﴾ پێیان بڵێ: ئەی پێغەمبەر! ﷺ هەموو -هات و نەهامەتییەك- هەر لەخواوەیەو، ئەوخۆی دروستی ئەکاو بەفەرمانی خۆیەتیی و، مەبەستیشی تاقیکردنەوەی ئێوەیە، چونکە تەنها ئەوخۆی ئەتوانێ کەڵك و زیان ببەخشێ ﴿فما لهؤلاء القوم لا یکادون یفقهون حدیثا﴾ ئەوە ئەوخەڵکە چییانە؟ خەریکە لەهیچ شتێك تێنەگەن و لەحەقیقەت حاڵی نەبن و، لەمەبەست و نیازەکانی قورئان خۆ گێلکەن ؟! ﴿[79] ما أصابك من حسنة فمن الله﴾ هەرخۆشیی و چاکەیەکت تووش بوو لەخواوەیە ﴿وما أصابك من سیئة فمن نفسك﴾ وهەر ناخۆشیی وخراپەیەکیشت تووش بوو لەخۆتەوەیە، واتە: بەرهەمی کرداری دەستی خۆتە، خۆت بەخۆتی ئەکەیت ﴿وأرسلناك للناس رسولا﴾ وئێمە تۆمان ناردووە ئەی پێغەمبەر! ﷺ بەپێغەمبەر بۆتەواوی خەڵکیی ﴿وکفی بالله شهیدا﴾ وخواش بەسە ئاگادارو شایەت بێت بۆگەیاندنی بەرنامەکەی خواو، وەڵامی ئەوان.

رێنماییەکانی ئایەتی (٧٧-٧٩):

١- تالووکەو پەلەوترس و کەم ورەیی، کارێکی ناشیاون و، ئەنجامێکی بی فەڕیان دەبێت.

٢- ئاخیرەت بۆ خۆپارێزان لەهەموو دونیا باشترە.

٣- هەرگیز بەخۆلادان لەجیهادو هەڵهاتن مردن دواناخرێت.

٤- خێرو شەڕ، چاك و خراپ، هەموو بەبڕیاری خوا دەبێ، هەر چاکەیەکت بۆپێش هات لەخواوەیە، هەموو خراپەیەکش لەلایەن خۆتەوەیە، خۆت بۆخۆتی هەڵدەبژێری، ئەگینە هەرگیز خوا بەکاری خراپە رازی نییە.

**بەر فەرمانی پێغەمبەر، بەر فەرمانی خوایە :**

﴿[80] من یطع الرسول فقد أطاع الله﴾ هەرکەسێك گوێڕایەڵی پەیامبەر ﷺ بکات، ئەوە بەراستی گوێڕایەڵی خوای کردووە، چونکە بەرفەرمانی پەیامبەر، بەرفەرمانی خوایە ﴿ومن تولی فما أرسلناك علیهم حفیظا﴾ و هەرکەسیش پشت هەڵبکات و گوێڕایەڵی نەکات، ئەوە ئێمە تۆمان نەناردووە کەپارێزەرو چاودێر بی بەسەریانەوە، دیارە کە بەرپرسیاریش نابیت لێیان، بەڵکو تەنها راگەیاندن و تەبلیغت لەسەرە ﴿[81] ویقولون طاعة﴾ و لەناو دووڕووەکاندا هەیە دەڵێن: بۆ هەموو ئیش وکارێ گوێڕایەڵ و فەرمانبەردارین ﴿فإذا برزوا من عندك﴾ جا هەرکە لەلای تۆ دەرچوون و دوورکەوتنەوە ﴿بیت طائفة منهم غیر الذی تقول﴾ دەستەیەکیان دژی قسەکانی تۆ شەو دەکەنەوە، واتە: لەلای خۆتا گوێیان بۆ ئەگرتی، کەچی کاتێ دوور دەکەوتنەوە شەویان بە کێشەو پیلان دەبردە سەر ﴿والله یکتب ما یبیتون﴾ و خوا دەینووسێ هەرپیلانێك بەشەودا دەیکەن ﴿فأعرض عنهم﴾ جا تۆ وازیان لێ بێنە ﴿وتوکل علی الله﴾ و هەر بەخوا پشت ببەستە ﴿وکفی بالله وکیلا﴾ و بەسە کارسازت تەنها خوا بێ.

**ئەر قورئان کاری غەیری خوا بوایە نارێك دەبوو:**

﴿[٨٢] **افلا یتدبرون القرآن**﴾ ئاخۆ ئەو دوورووانە بۆچی لەماناومەبەستی قورئان وردنابنەوە کە چەندە وردو پڕحیکمەتە، هەتا باوەڕ بێنن ﴿**ولو کان من عند غیرالله**﴾ خۆئەگەر لەغەیری خوا بووبا ﴿**لو جدوا فیه اختلافا کثیرا**﴾ بێگومان شێواوی و دژایەتییەکی زۆریان -لەرووی ڕەوانبێژی و خۆشخوانیی و ماناو مەبەستەوە- تیا بەدی ئەکرد، بەڵام چونکە فەرموودەی خوایە، دەبینی لەهەموو کەم وکورتیی و ناتەواوی ودژایەتیەك دوورە.

**تا سەرکردە نەزانێ هەواڵەکان بڵاو نەکەنەوە:**

﴿[٨٣] **وإذا جاءهم امر من الأمن او الخوف**﴾ هەرکە هەواڵێکی خۆش وەك بەدستهێنانی ئەمن و ئاساییش و سەرکەوتن, یان هەواڵێکی ناخۆش و ترسناکیان پێبگا ﴿**اذاعوا به**﴾ سەربەخۆ بڵاویان دەکردەوەو لای هەمووکەس دەیانکردە هەرا، بێ لێکۆڵینەوە ئاخۆ ئەو هەواڵە ڕاستە، یان نا؟ چاك وایە بشاردرێتەوەو کپ بکرێتەوە، یان بڵاو بکرێتەوە؟ واتە: دەبوو بزانرابا ئەو هەواڵە ڕاستە یان نا؟ بەرژەوەندی تێدایە بڵاو بکرێتەوە، یان نا، ئەوسا بڵاو بکرایەتەوە؟ ﴿**ولو ردوه إلى الرسول وإلى أولى الأمر منهم**﴾ خۆئەگەر بیانبردایەتەوە بۆلای پەیامبەر ﷺ و فەرماندەکانیان ﴿**لعلمه الذین یستنبطونه منهم**﴾ ئەوا خاوەن سەلیقەکانیان دەیانزانی هەواڵە ڕاستەکەی لێدەربێنن ﴿**ولولا فضل الله علیکم ورحمته**﴾ ئەگەر فەزڵ و میهرەبانی خوا بەسەرتانەوە نەبوایە، کەلەسەر ئیمان دایمەزراندن ﴿**لاتبعتم الشیطان إلا قلیلا**﴾ کەمێکتان نەبێ پەیڕەویتان لەشەیتان دەکردو، بە وەسوەسەو دەغدەغەی خۆی لەخشتەی دەبردن، بەڵام بەفەزڵ و ڕەحمەتی خۆی نەیهێشت وپاراستنی.

الجُزءُ الخَامِس | سُورَةُ النِّسَاءِ

مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدۡ أَطَاعَ ٱللَّهَۖ وَمَن تَوَلَّىٰ فَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ
عَلَيۡهِمۡ حَفِيظٗا ﴿٨٠﴾ وَيَقُولُونَ طَاعَةٞ فَإِذَا بَرَزُواْ مِنۡ
عِندِكَ بَيَّتَ طَآئِفَةٞ مِّنۡهُمۡ غَيۡرَ ٱلَّذِي تَقُولُۖ وَٱللَّهُ يَكۡتُبُ
مَا يُبَيِّتُونَۖ فَأَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا
﴿٨١﴾ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلۡقُرۡءَانَۚ وَلَوۡ كَانَ مِنۡ عِندِ غَيۡرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُواْ
فِيهِ ٱخۡتِلَٰفٗا كَثِيرٗا ﴿٨٢﴾ وَإِذَا جَآءَهُمۡ أَمۡرٞ مِّنَ ٱلۡأَمۡنِ
أَوِ ٱلۡخَوۡفِ أَذَاعُواْ بِهِۦۖ وَلَوۡ رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ وَإِلَىٰٓ أُوْلِي
ٱلۡأَمۡرِ مِنۡهُمۡ لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسۡتَنۢبِطُونَهُۥ مِنۡهُمۡۗ وَلَوۡلَا فَضۡلُ
ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ لَٱتَّبَعۡتُمُ ٱلشَّيۡطَٰنَ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿٨٣﴾
فَقَٰتِلۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفۡسَكَۚ وَحَرِّضِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ
عَسَى ٱللَّهُ أَن يَكُفَّ بَأۡسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۚ وَٱللَّهُ أَشَدُّ بَأۡسٗا
وَأَشَدُّ تَنكِيلٗا ﴿٨٤﴾ مَّن يَشۡفَعۡ شَفَٰعَةً حَسَنَةٗ يَكُن لَّهُۥ
نَصِيبٞ مِّنۡهَاۖ وَمَن يَشۡفَعۡ شَفَٰعَةٗ سَيِّئَةٗ يَكُن لَّهُۥ كِفۡلٞ مِّنۡهَاۗ
وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ مُّقِيتٗا ﴿٨٥﴾ وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٖ فَحَيُّواْ
بِأَحۡسَنَ مِنۡهَآ أَوۡ رُدُّوهَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٍ حَسِيبًا ﴿٨٦﴾

٩١

**ڕێنماییەکانی ئایەتی (٨٠-٨٣):**

١- گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری پێغەمبەر ﷺ، بڕیارێکی خوایی واجیبە، چونکە فەرمانی خوای لەسەرە.

٢- دەبێ بۆ بەهێزبوونی ئیمان و باوەڕمان لەنەبوونی ناکۆکیی و دژایەتی و هەڵە لەنێو قورئاندا تێ بفکرێین.

٣- دەبێ هەموو هەواڵەکان، بەتایبەتی هەواڵەکانی بەرەی جەنگ, هەر فەرماندە جەنگییەکان -پاش لەبێژنگ دانیان- ڕایانبگەیەنن و بڵاویان بکەنەوە.

٤- خەڵکێکی زۆر هەیە کە هەر بەبیستنی جۆرە هەواڵێك, خێرا دەگۆڕێ و ورە لەدەست دەدات.

**ئەر بەتەنیاش بیت بجۆرە جیهاد:**

﴿[٨٤] **فقاتل فی سبیل الله**﴾ ئینجا لەپێناوی ئاییینی خواو ڕزگارکردنی لاوازەکاندا کۆشتارو. خەزا بکە ئەی پێغەمبەر! ئەگەر بەتەنها خۆیشت بیت ﴿**لا تکلف إلا نفسك**﴾ تۆهەر لەهیدایەت و ئەرکی خۆت بەرپرسیت ﴿**وحرض**

المؤمنین﴾ و دەنەو هانەی باوەڕدارەکانیش بدە بۆ جیهادو کوشتارو جەنگ دژی خوانەناسان ﴿عسى الله أن یکف بأس الذین کفروا﴾ بێگومانبە خوا بەهۆی ئەوجیهادەوە لەزەبرو زۆرو خراپەی ئەو بێ باوەڕانە دەتانپارێزێ.

**تێبینی:** (تەبەری) دەڵێ: هەمووکردارێکی (عسی) کەبێژەی (الله) بکاری بێت بۆحەتمیی و واجبە، واتە: تەحقیق و حەتمیەت دەگەیەنێت، نەك بۆهیواو ئومێد. ﴿والله اشد بأسا﴾ و هێزو هەڵمەتی خوا لەوان سەختترە لەجەنگدا ﴿واشد تنکیلا﴾ لەسزاو تۆڵەیشدا توندترو تیژترە. بەڵێ هەر بەجیهاد دەستدرێژیی بێ باوەڕان لە کۆڵ ئەکەوێت، بۆیە پێویستە موسڵمانان بە وتارو سیمینارو بڵاوکراوە بۆ ئەومەبەستە هۆشیار بکرێنەوە ﴿[85] من یشفع شفاعة حسنة﴾ هەرکەس تکای هەرکارێکی چاك بکاو، مەبەستیشی بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوا بێ، وەك چاککردنی نێوان موسڵمانان, یان دەنگی خۆی بخاتە پاڵ دەنگی هەژاران و مافخوراوان و پشتگیری لەهەق بکات ﴿یکن له نصیب منها﴾ بەشێکی باشی لەو خێروچاکەیە بۆ دەبێ، واتە: خوای گەورە پاداشتی چاکی دەداتەوە ﴿ومن یشفع شفاعة سیئة﴾ و هەرکەسێکیش تکا بۆ هەرکارێکی خراپە بکاو هەوڵی سەرخستنی بدا، واتە: تکا بۆ کاری ناڕەواو خراپە بکاو، هاوکاری خەڵکانی خراپ بکات، بۆ تێکدانی نێوان موسڵمانان و، پشتگیری لەناهەق و باتڵ بکا ﴿یکن له کفل منها﴾ بەشێکی لەوکارە خراپەیە بۆ دەبێ و تۆڵەدەدرێ لەبەرامبەریەوە﴿وکان الله على کل شئ مقیتا﴾ و خوایش هەمیشە بەسەر هەمووشتێکدا بەتواناو چاودێرە، پاداشت و تۆڵەی هەمووکەسێك بەپێی شیاوی خۆی ئەداتەوە ﴿[86] وإذا حییتم بتحیة﴾ و کاتێ بەهەرجۆرێك چاك وچۆنی و سڵاوتان لێبکرێ لەلایەن موسڵمانانەوە ﴿فحیوا بأحسن منها أو ردوها﴾ جائێوە بەجوانتر لەو چاك و چۆنی لەباوەڕداران بکەن, یان هەرهیچ نەبێت وەکو خۆی وەڵام بدەنەوە، واتە: ئەگەر ئەو گوتی: (السلام علیکم) ئێوە لەوەڵامدا بڵێن: (وعلیکم السلام ورحمة الله)، خۆئەگەر گوتی: (السلام علیکم و رحمة الله) ئێوە بڵێن: (وعلیکم السلام ورحمة الله وبرکاته). ﴿إن الله کان على کل شئ حسیبا﴾ بەڕاستیی خوا بەحسابی هەمووشتێك دەگاو لەگشت کەسێك دەپرسێتەوەو پاداشتی هەمووکارێکیش ئەداتەوە ﴿[87] الله لاإله إلا هو﴾ کە ئەوخوا بەدەسەڵاتە خۆی نەبێ، هیچ پەرستراوێکی دیکە بەهەق نییە شیاوی پەرستن بێت ﴿لیجمعنکم إلى یوم القیامة لا ریب فیه﴾ سوێند بەخوا خۆی , ئێوە هەموو بۆ ڕۆژی قیامەت -کەهاتنی هیچ گومانێکی تێدا نییە- کۆئەکاتەوە.

**ئاگاداریی:** قورتوبی دەڵێ: (وکل لام بعدها نون مشددة، فهو لام القسم) واتە: هەموو لامێك بچێتە سەر هەر کردارێك و (ن)ی گیراو بەدوایدا بێت، وەکو (لیجمعنکم) یان (لتبعثن) بۆ سوێند دەبێ. ﴿ومن اصدق من الله حدیثا﴾ جاکێ لەخوا قسەو گوفتاری ڕاستترە؟!.

**دەبێ بەرامبەر دوڕوویەك ڕابن:**

ئیمامی (موسلیم)لە (زەید)ەوە(خوا لێیان ڕازیی بێت) ئەڵێت: پەیامبەر ﷺ لەگەڵ چەند کەسێکدا ڕۆیشت بۆ (ئوحود)، بەڵام هەر لەڕێگەدا گەلێکیان (وەك ئوبەی وهاوڕێکانی) گەڕانەوە، ئینجا لەبەرامبەر ئەوکارەیەوە هاوەڵان بوونە دوودەستە: دەستەیەکیان وتیان: دەبێ جەنگیان لەگەڵ بکەین و بیانکوژین. دەستەیەکی تریان وتیان: نابێ جەنگیان لەگەڵ بکەین، چونکە بەڕواڵەت بڕوادارن! جاخوا فەرمووی: ﴿[88] فما لکم في المنافقین فئتین﴾ چیتانە (ئەی بڕواداران) سەبارەت بەو دووڕووانە دوودەستەن؟ بۆ بەتێکڕا بڕیاری کوفریان نادەن ﴿والله ارکسهم بما کسبوا﴾ خۆ خوا ژێرەو ژووری کردوون و بەکافر دایناون, چونکە چاك ئەیانناسێ, کەوابوو ئێوەش دوودڵ مەبن بەرامبەریان و بشزانن کە کافرن و تۆڵەیان هەر کوشتنە ﴿أتریدون أن تهدوا من أضل الله﴾ ئاخۆ کەسێك خوا گومڕای کردبێت,

ئێوه دەتانەوێ ڕێی ڕاستی نیشان بدەن ؟! ﴿ومن یضلل الله فلن تجد له سبیلا﴾ خۆ دیاره هەرکەسێك خوا خۆی
گومڕای بکات، هەرگیز ناتوانیت هیچ ڕێگەیەك بۆ دەربازبوونی بدۆزیتەوه ﴿٨٩ ودوا لو تکفرون کما کفروا﴾
دووڕووەکان ئاوات ئەخوازن و ئەیانەوێ – وەك خۆیان خوانەناسن, ئێوەش بێ باوەڕبن و لەدین وەرگەڕێن
﴿فتکونون سواء﴾ ئەوسا هەموو وەك یەکتان لێبێ و یەکسان بن لەگومڕاییدا ﴿فلا تتخذوا منهم أولیاء﴾ جا ئێوه
دۆستایەتییان مەکەن و مەیانگرنه دۆست ﴿حتی یهاجروا فی سبیل الله﴾ تا لەڕێی خوا کۆچ دەکەن و بەباشی خۆیان
یەکلادەکەنەوه بۆخوا ﴿فإن تولوا﴾ خۆئەگەر ڕوویان وەر چەرخاندو کۆچیان نەکرد ﴿فخذوهم واقتلوهم حیث و
جدتموهم﴾ ئەوا ئێوەش لەهەر کوێ دەستتان کەوتن بیانگرن و بیانکوژن ﴿ولا تتخذوا منهم ولیا ولا نصیرا﴾ و
لەهیچ کامیشیان دۆست و یارمەتیدەر مەگرن, تا ئەوکاته
ئەوانیش لەمەککه باردەکەن و پەیوەندییان بەوانەوه
ئەپچڕێ ﴿٩٠ إلا الذین یصلون إلی قوم بینکم وبینهم میثاق﴾
ئەوکەسانەیان نەبێ پەنا دەبەنه بەر تیرەو هۆزێك که
پەیمان و بەڵێن لەنێوانتاندایه, واته: بوونەته هاوپەیمانی
هاوپەیمانتان, لەکاتی وادا ئەوانیش وەك هاوپەیمانەکانتان
خوێنیان پارێزراوەو نابێ لەگەڵیان بەجەنگ بێن ﴿او
جاءوکم حصرت صدورهم ان یقاتلوکم او یقاتلوا قومهم﴾
یان مەگەر ئەوکەسانەی بەناچاری هاتبنه لاتان و دوودڵ بن
لەگەڵتان جەنگ بکەن، یان تووشی خزم کوشتن بن، چوون
هەروەك لەگەڵتان نین، دوژمنایەتیشتان ناکەن، جاکەوابوو
خەڵکانی ئاوا مەکەنه دوژمن و لەگەڵیان بەجەنگ مەیەن,
باهەر بەبێ لایەن بمێننەوه ﴿ولوشاءالله لسلطهم علیکم
فلقاتلوکم﴾ خۆئەگەر خوا ویستبای زاڵی دەکردن
بەسەرتاناو بەجەنگ دەهاتن لەگەڵتاندا، بەڵام وائێستا خوا
دڵی ڕاگرتوون ونایانەوێ لەگەڵتان نەیار بن ﴿فإن
اعتزلوکم﴾ جاکه ئەوان خۆیان لاداوه لێتان ﴿فلم یقاتلوکم﴾
و جەنگیان لەگەڵ نەکردوون ﴿والقوا إلیکم السلم﴾ و بۆخۆیان ڕێ و ڕێبازی ئاشتییان گرتۆته بەر ﴿فما جعل الله
لکم علیهم سبیلا﴾ خواش هیچ ڕێگەیەکی نەداوه بەئێوه دەسیان بۆبەرن وجەنگیان لەگەڵ بکەن ﴿٩١ ستجدون
اخرین یریدون ان یأمنوکم﴾ بەتەئکید بڕێکی تریانتان دەست دەکەوێ، ئەیانەوێ ئێوه ئەمین بکەن و ترسیان نەبێ
لێتان ﴿و یأمنوا قومهم﴾ و قەوم هۆزەکەشیان ئەمین بکەن و لێیان نەترسن, ئەوسا ئەگەر ئێوه سەرکەوتن بەسەر
موشریکەکاندا دەڵێن: ئێمه لەگەڵ ئێوەین ! کاتێکیش موشریکەکان بەسەر ئێوەدا زاڵ بوون دەچنەوه لای قەوم و
هۆزی خۆیان و لەگەڵ ئەوان دەبن و بتان دەپەرستن ﴿کلما ردوا إلی الفتنة ارکسوا فیها﴾ ئەوسا هەرکاتێکیش بۆیان
بکرێت، بێ سێ و دوو دەچنەوه ناو شیرك و بێ دینیەکەی خۆیان ﴿فإن لم یعتزلوکم﴾ جائەگەر لەبەدفەڕی و
ئاژاوەنانەوه خۆیان لانەدا لێتان ﴿و یلقوا إلیکم السلم﴾ و پێشنیازی ئاشتی و ملکەچیشیان دەرنەبڕی بۆتان، واته:

الجزء الخامس سورة النساء

ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ لَيَجۡمَعَنَّكُمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَا رَيۡبَ فِيهِۗ وَمَنۡ أَصۡدَقُ مِنَ ٱللَّهِ حَدِيثٗا ﴿٨٧﴾ ۞ فَمَا لَكُمۡ فِي ٱلۡمُنَٰفِقِينَ فِئَتَيۡنِ وَٱللَّهُ أَرۡكَسَهُم بِمَا كَسَبُوٓاْۚ أَتُرِيدُونَ أَن تَهۡدُواْ مَنۡ أَضَلَّ ٱللَّهُۖ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ سَبِيلٗا ﴿٨٨﴾ وَدُّواْ لَوۡ تَكۡفُرُونَ كَمَا كَفَرُواْ فَتَكُونُونَ سَوَآءٗۖ فَلَا تَتَّخِذُواْ مِنۡهُمۡ أَوۡلِيَآءَ حَتَّىٰ يُهَاجِرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَخُذُوهُمۡ وَٱقۡتُلُوهُمۡ حَيۡثُ وَجَدتُّمُوهُمۡۖ وَلَا تَتَّخِذُواْ مِنۡهُمۡ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرًا ﴿٨٩﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ يَصِلُونَ إِلَىٰ قَوۡمِۭ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَهُم مِّيثَٰقٌ أَوۡ جَآءُوكُمۡ حَصِرَتۡ صُدُورُهُمۡ أَن يُقَٰتِلُوكُمۡ أَوۡ يُقَٰتِلُواْ قَوۡمَهُمۡۚ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَسَلَّطَهُمۡ عَلَيۡكُمۡ فَلَقَٰتَلُوكُمۡۚ فَإِنِ ٱعۡتَزَلُوكُمۡ فَلَمۡ يُقَٰتِلُوكُمۡ وَأَلۡقَوۡاْ إِلَيۡكُمُ ٱلسَّلَمَ فَمَا جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمۡ عَلَيۡهِمۡ سَبِيلٗا ﴿٩٠﴾ سَتَجِدُونَ ءَاخَرِينَ يُرِيدُونَ أَن يَأۡمَنُوكُمۡ وَيَأۡمَنُواْ قَوۡمَهُمۡ كُلَّ مَا رُدُّوٓاْ إِلَى ٱلۡفِتۡنَةِ أُرۡكِسُواْ فِيهَاۚ فَإِن لَّمۡ يَعۡتَزِلُوكُمۡ وَيُلۡقُوٓاْ إِلَيۡكُمُ ٱلسَّلَمَ وَيَكُفُّوٓاْ أَيۡدِيَهُمۡ فَخُذُوهُمۡ وَٱقۡتُلُوهُمۡ حَيۡثُ ثَقِفۡتُمُوهُمۡۚ وَأُوْلَٰٓئِكُمۡ جَعَلۡنَا لَكُمۡ عَلَيۡهِمۡ سُلۡطَٰنٗا مُّبِينٗا ﴿٩١﴾

ڕێگای ئاشتییان نەگرتەبەر ﴿ويكفوا ايديهم﴾ و دەستیشیان لەکوشتن و بڕینتان هەڵنەگرت ﴿فخذوهم واقتلوهم حيث ثقفتموهم﴾ ئەوسا ئێوەش لەهەرجێگایەکدا دەستتان بەسەریاندا زاڵبوو بیانگرن و دیلیان بکەن، خۆئەگەر دەستدرێژی کاریش بوون بیانکوژن ﴿واولئكم جعلنا لكم عليهم سلطانا مبينا﴾ بۆئەوانەی وا دژایەتیتان دەکەن، دەسەلاتمان پێتانداوە -لەبەرئەو خیانەت و گزیکاریەیان- ئێوەش دژایەتییان بکەن و چۆن بۆتان گونجا بیانکوژن

﴿[٩٢] وماكان لمؤمن ان يقتل مؤمنا﴾ ڕێنەدراوە هیچ باوەڕدارێك باوەڕدارێکی دیکە بکوژێت، بۆیە ئەوهەموو وردەکاریی و (ئیحتیات)ەشکراوە ﴿إلا خطأ﴾ بەخەتاو بەهەڵە نەبێت، ئەگینا کوشتنی موسڵمان-بەناهەق- هەرگیز ڕەوانییە ﴿ومن قتل مؤمنا خطأ﴾ و هەرکەسێك مرۆڤێکی باوەڕداری بەهەڵە کوشت، دەبێ لەتۆڵەیدا دووشت ئەنجام بدات ﴿فتحرير رقبة مؤمنة﴾ یەکەم: ئازادکردنی کۆیلەیەکی باوەڕدار، چونکە گوناهێکی گەورەی کردووە ﴿ودية مسلمة إلى أهله﴾ دووەم: خوێنێك بەکەس و کارەکەی بدرێ ﴿إلا ان يصدقوا﴾ مەگەر بیکەنە صەدەقەو بیبەخشن ﴿فإن كان من قوم عدو لكم﴾ خۆئەر کوژراوەکە لە تیرەیەکی خوانەناسی دوژمنتان بوون ﴿وهو مؤمن﴾ و موسڵمانیش بوو، ئەوا یەك شتی دەکەوێتە سەر، وەکو دەفەرموێ: ﴿فتحرير رقبة مؤمنة﴾ بەندەیەکی باوەڕدار ئازاد بکات، واتە: خوێنی نادرێ ﴿و إن كان من قوم بينكم وبينهم ميثاق﴾ خۆئەگەر ئەومرۆڤە ئیمانداره کوژراوە لەتیرەیەکی خوانەناسی سوێندخۆرو هاوپەیمانتان بوو ﴿فدية مسلمة إلى اهله﴾ ئەبێ تۆڵەی خوێنەکەی بەمیراتبەری کوژراوەکە بدرێ ﴿و تحرير رقبة مؤمنة﴾ و بەندەیەکی بڕواداریش ئازادبکا ﴿فمن لم يجد﴾ جا هەرکەسێك بەندەی دەست نەکەوت، واتە: توانای کڕینی نەبوو، یان هەربەندە نەمابوو، وەکو ئێستا ﴿فصيام شهرين متتابعين﴾ ئەوە دوومانگی ڕەبەق لەسەر یەك بێ وچان بەڕۆژوو دەبێ، مەگەر نەخۆش بێت ﴿توبة من الله﴾ تاخوا پەشیمانی لەبکوژەکە وەرگرێ ﴿وكان الله عليما حكيما﴾ و خواش زانای کار دروستە، ئەزانێ چ بڕیارێك چاکە بۆئادەمیزاد.

الجزء الخامس — سورة النساء

وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَن يَقْتُلَ مُؤْمِنًا إِلَّا خَطَـًٔا ۚ وَمَن قَتَلَ
مُؤْمِنًا خَطَـًٔا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ
أَهْلِهِۦٓ إِلَّآ أَن يَصَّدَّقُوا۟ ۚ فَإِن كَانَ مِن قَوْمٍ عَدُوٍّ لَّكُمْ
وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ ۖ وَإِن كَانَ
مِن قَوْمٍۭ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَـٰقٌ فَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ
إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ وَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ ۖ فَمَن لَّمْ يَجِدْ
فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ تَوْبَةً مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَكَانَ
ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٩٢﴾ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا
مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَـٰلِدًا فِيهَا وَغَضِبَ
ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُۥ وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمًا ﴿٩٣﴾ يَـٰٓأَيُّهَا
ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا ضَرَبْتُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَتَبَيَّنُوا۟ وَلَا تَقُولُوا۟
لِمَنْ أَلْقَىٰٓ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَـٰمَ لَسْتَ مُؤْمِنًا تَبْتَغُونَ
عَرَضَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا فَعِندَ ٱللَّهِ مَغَانِمُ كَثِيرَةٌ ۚ
كَذَٰلِكَ كُنتُم مِّن قَبْلُ فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْكُمْ
فَتَبَيَّنُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴿٩٤﴾

٩٣

### کوشتنی موسڵمانێ بە ئەنقەس تۆڵەی جەحەنەمە بەردەوام:

﴿[٩٣] ومن يقتل مؤمنا متعمدا﴾ و هەرکەسێك بەدەستی ئەنقەست مرۆڤێکی خاوەن باوەڕ بکوژێ ﴿فجزاؤه جهنم خالدا فيها﴾ سزاو تۆڵەی هەر دۆزەخەو بەهەتاهەتاییش تێیدا ئەمێنێتەوە ﴿وغضب الله عليه ولعنه﴾ غەزەب و تووڕەیی خوا لەسەرەو نەفرینیشی لێکردووە ﴿واعد له عذابا عظيما﴾ و سزایەکی گەورەو قورسیشی بۆئامادە کردووە.

رێنماییەکانی ئایەتی (٩٢-٩٣):

١- مرۆڤی خاوەنباوەڕ، هەرگیز ناتوانێ بەدەس ئەنقەست کەسێکی باوەڕدار بەناهەق بکوژێ.

٢- تۆڵەی کوشتنی مرۆڤ بەهەڵە: ئازادکردنی بەندەیەکی باوەڕدارە، دەبێ خوێنەکەیشی بدرێ بەکەس و کارەکەی.

٣- ئەگەر کوژراوەکە لەهۆزی بوو پەیمانیان لەگەڵ مۆرکرابوو، دەبێ خوێن بەکەسوکارەکەی بدرێ و، بەندەیەکیش ئازاد دەکرێ.

٤- ئەگەر کوژراوەکە موسڵمان بوو، بەڵام سەر بەهۆزێکی کافرو دژوار بوو، بۆئەوە تەنیا بەندەیەك ئازاد دەکرێت. واتە: خوێنیان پێنادرێ.

٥- هەرکەسێ بەندەی دەس نەکەوت، دەبێ دوومانگی رەبەق - بەدوای یەکدا - بەرۆژوو بێ.

٦- کوشتنی دەس ئەنقەست: یا تۆڵەو (قیصاص)ی لێوەردەگیردرێ، یان بەتەنیا خوێنی دەدرێ، خۆئەگەر کەس و کارەکەی هیچ کامێکیان ئەنجام نەدا بۆکەس وکاری کوژراوەکە، ئەوا خوا لەقیامەتدا پاداشتی دەداتەوەو بۆخۆیشی کارێکی باشیکردووە.

**کە چوونە جیهاد هەموو شتێ لێك بدەنەوە:**

ئیمامی (بوخاریی) دەڵێ: کابرایەکی دەوڵەمەند باوەڕی هێناو، موسڵمانەکانیش بێ ئاگابوون لێی، جاکاتێ هات و سڵاوی لێکردن، ئەوان وتیان: ئەمە بۆئەوە سڵاو دەکا ئێمە نەیکوژین و، مەڕومالاتەکەی بپارێزێ، بۆیە لێیان قەبووڵ نەکردو کوشتیان!! جا ئەم ئایەتە هات وفەرمووی: ﴿[٩٤] یاأیها الذین آمنوا إذا ضربتم فی سبیل الله﴾ ئەی ئەوکەسانەی باوەڕتان هێناوە! کاتێ لەبەر رێی خوا دەچنە جیهاد، یان هەرکارێکی تر دەکەن ﴿فتبینوا﴾ بەباشی بکۆڵنەوە لەو خەڵکەی پێیان دەگەن و لەخۆتانەوە بە کافریان دامەنێن و مەیانکوژن ﴿ولا تقولوا لمن ألقى إلیکم السلام لست مؤمنا﴾ و ئەوکەسە داوای ئاشتیی دەکاو دەیەوێ فەرمانبەردار بێ، ئێوە پێی مەڵێن: ئیماندار نیت ﴿تبتغون عرض الحیاة الدنیا﴾ دەتانەوێ بەوە سامان و داراییەکی ژیانی دونیا بەدەست بخەن ﴿فعندالله مغانم کثیرة﴾ خۆ بەلای خواوە غەنیمەتێکی زۆرو فراوان هەیە ﴿کذلك کنتم من قبل﴾ ئێوەیش -بەر لەمە- هەر ئاوابوون و ئیمان هێنانتان هەر بەوشێوە بوو لێیشتان وەرگیرا ﴿فمن الله علیکم﴾ جاخوا بەبەزەیی خۆی رێزی گرتن و منەتی نایە سەرتان و دینی خۆی سەرخست و، ئێوەش ئیمانی خۆتانتان دەربڕی ﴿فتبینوا﴾ جا بۆجارێکی تر پێیان دەڵێتەوە: لەکارەکانتان بکۆڵنەوە ئەوسا ئەنجامیان بدەن. واتە: پەلە مەکەن لەبڕیارداو وردو لەسەرخۆبن ﴿إن الله کان بما تعملون خبیرا﴾ بەراستی خوا هەمیشە لەوکاروکردەوە دەیکەن بەئاگایەو، هەر بەپێی ئەوەش پاداشت وتۆڵەتان ئەداتەوە.

رێنماییەکانی ئایەتی (٩٤):

١- دەبێ بۆجیهاد رێگەی دوورو درێژ ببڕدرێ.

٢- دەبێ لەو شتانە بکۆڵینەوە کە کردنیشیان بەهەڵە زیانێکی گەورەی لێ دەوەشێتەوە.

٣- وەرگرتنی پەندو ئامۆژگاری لەڕووداوەکان.

## موسڵمانی جەنگاوەرو دانیشتوو کەی وەك یەکن:

پێشەوا (بوخاریی) لە(بەراء)ەوە دەگێڕێتەوە: کاتێ کەئایەتی: (لایستوی القاعدون من المؤمنین..) هاتەخوارێ، پێغەمبەر ﷺ (زەید)ی بانگکرد تابۆی بنوسێ، ئەویش دەفەی شانی حەیوانێکی هێناو ئایەتەکەی لەسەر نووسی، پاشان کوڕەکەی (ئوممی مەکتوم) هات وسکاڵای نابینایی خۆی کردو رایگەیاند کە لەبەر نابینایی ناتوانێ بچێت بۆجیهاد، دەبێ چارەی چی بێت, ئەوجا بەشەکەی تری هات و فەرمووی: (.. غیر اولی الضرر ..). ﴿٩٥ لایستوی القاعدون من المؤمنین غیر أولی الضرر والمجاهدون فی سبیل الله بأموالهم وانفسهم﴾ واتە: ئەو دانیشتووە بڕوادارانە –جگە لەوانەیان نوقوستانن– و موجاهیدانێ کە بەماڵ و بەگیانیان لەڕێی خوادا تێدەکۆشن یەکسان نین، واتە: کەسێك لەگۆڕەپانـدا بێ وجیهاد بکات، لەگەڵ کەسێکی دانیشتوودا یەکسان نین، مەگەر ئەودانیشتووە عوزرێکی شەرعیی هەبێت، وەك شەلیی و کوێریی و هەر ناتەواوییەکی تر، یان فەرماندەکەی مۆڵەتی دابێت و گۆڕەپانی جێ هێشتبێت. بەڵێ لەم جێگایەدا فەزڵی هەندێ لەموجاهیدانی بەسەرهەندێکی دیکەدا نەداوەو، سەرجەم چوونیەك باسیان دەکا، بەڵام لەسوورەتی (حەدید: ١٠)دا بەڕاشکاوەیی دەبینرێ کە هەندێکیان فەزڵیان هەیە بەسەر هەندێکی تریاندا، وەك دەفەرموێ: (لا یستوی منکم من أنفق من قبل الفتح وقاتل أولئك أعظم درجة من الذین أنفقوا من بعد وقاتلوا وکلا وعدالله الحسنی). ﴿فضل الله المجاهدین بأموالهم وانفسهم علی القاعدین درجة﴾ ئەوموجاهیدانەی کە بەماڵ و بەگیانیان جیهاد دەکەن, خوا بە پلەیەك فەزڵی داون بەسەر دانیشتواندا، تەنانەتی بەسەر ئەوانەشدا بیانوویان هەیە، یان مۆڵەت دراون. بەڵێ.. ئەوکەسەی ئامادەیی جیهادی هەیەو، بیانوویەك دەستی دەگرێ و بۆی ناگونجێت، لای خوا هەر بەموجاهید دەدرێتە قەڵەم، بەڵام ئەڵبەتە وەك ئەوموجاهیدە نییە کە بەسامان و بەگیان لەگۆڕەپاندایە ﴿وکلا وعدالله الحسنی﴾ وخوا بەڵێنی پاداشتی بەرزو بەنرخ و چاکی داوە بەهەردوولایان، واتە: بەخەڵکانی دانیشتووی بەبیانوو و، موجاهیدی ناوگۆڕەپان ﴿وفضل الله المجاهدین علی القاعدین اجر عظیما﴾ و خوا بەکرێ و مزەیەکی مەزن فەزڵی موجاهیدانی داوە بەسەر خەڵکانی دانیشتوودا ﴿٩٦ درجات منه﴾ ئەویش چەندین پلەیە بەفەزڵی خۆی ﴿ومغفرة ورحمة﴾ هاوڕێ لەگەڵ لێبوردن و میهرەبانیی ﴿وکان الله غفورا رحیما﴾ وخوا هەمیشە لێبوردەی میهرەبانە. بیانوو و پۆزش لەبیانووداران وەرئەگرێ و, پاداشی کۆشەران فراوان دەکات.



لَّا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ وَالْمُجَاهِدُونَ
فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فَضَّلَ اللَّهُ الْمُجَاهِدِينَ بِأَمْوَالِهِمْ
وَأَنفُسِهِمْ عَلَى الْقَاعِدِينَ دَرَجَةً وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَىٰ وَفَضَّلَ اللَّهُ
الْمُجَاهِدِينَ عَلَى الْقَاعِدِينَ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٩٥﴾ دَرَجَاتٍ مِّنْهُ وَمَغْفِرَةً
وَرَحْمَةً وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٩٦﴾ إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ
ظَالِمِي أَنفُسِهِمْ قَالُوا فِيمَ كُنتُمْ قَالُوا كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي الْأَرْضِ
قَالُوا أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ اللَّهِ وَاسِعَةً فَتُهَاجِرُوا فِيهَا فَأُولَٰئِكَ مَأْوَاهُمْ
جَهَنَّمُ وَسَاءَتْ مَصِيرًا ﴿٩٧﴾ إِلَّا الْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ
وَالنِّسَاءِ وَالْوِلْدَانِ لَا يَسْتَطِيعُونَ حِيلَةً وَلَا يَهْتَدُونَ سَبِيلًا ﴿٩٨﴾
فَأُولَٰئِكَ عَسَى اللَّهُ أَن يَعْفُوَ عَنْهُمْ وَكَانَ اللَّهُ عَفُوًّا غَفُورًا ﴿٩٩﴾
۞ وَمَن يُهَاجِرْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ يَجِدْ فِي الْأَرْضِ مُرَاغَمًا كَثِيرًا وَسَعَةً
وَمَن يَخْرُجْ مِن بَيْتِهِ مُهَاجِرًا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ يُدْرِكْهُ الْمَوْتُ
فَقَدْ وَقَعَ أَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٠٠﴾ وَإِذَا ضَرَبْتُمْ
فِي الْأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُوا مِنَ الصَّلَاةِ إِنْ خِفْتُمْ
أَن يَفْتِنَكُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا إِنَّ الْكَافِرِينَ كَانُوا لَكُمْ عَدُوًّا مُّبِينًا ﴿١٠١﴾

ربع الحزب ١٠

**نابێ لەناو موشریکاندا دانیشی:**

پێشەوا (بوخاریی) لە(ئیبن عەباس)ـەوە دەگێڕێتەوە: کە هەندێ لەموسڵمانان بەهۆی ماڵ و سەروەتیانەوە لەمەککە کۆچیان نەکردو، گەلێ جار دەبوونە مایەی زۆربوون و قەڵەباڵغکردنی هۆزی بێ باوەڕان لەبەرامبەر هێزی پێغەمبەرەوە ﷺ هەندێ جاریش بێ باوەڕەکان بەزۆر دەیانبردن بۆگۆڕەپانی جەنگ و دەشکوژرا، ئینجا خوای کاربزان ئەم ئایەتەی ناردو فەرمووی: ﴿[٩٧] إن الذين توفاهم الملائكة ظالمي أنفسهم﴾ بێگومان ئەوانەیان کە فریشتە گیانیکێشان, لەکاتێکدا ناهەقییان لەخۆیان کرد, چونکە (دار الشرك) یان بەجێ نەهێشت و کۆچیان نەکرد بۆنیشتمانی ئیمان (مەدینە) ﴿قالوا فيم كنتم﴾ بەرلەوە ئەڵێن: باشە ئێوە لەکوێبوون, بۆچی لێرە کۆچتان نەکردو لەگەڵ موشریکەکاندا مانەوە ؟! ﴿قالوا كنا مستضعفين في الأرض﴾ ئەڵێن: ئێمە لەو وڵاتەی مەککەدا بێ دەوسەڵات و لاوازکرا بووین، نەمان دەتوانی بۆهیچ لایە کۆچ بکەین و بەناچاریی هەر لەوشوێنە ماینەوە ﴿قالوا ألم تكن أرض الله واسعة﴾ فریشتەکان ئەڵێن: ئایا زەویی خوا فراوان و ئاواڵە نەبوو ﴿فتهاجروا فيها﴾ تا لەوێ کۆچ بکەن و بڕۆنە جێگایەکی ترو, بەئازادانە خواپەرستی خۆتانتان کردبا؟ ﴿فأولئك مأواهم جهنم وساءت مصيرا﴾ جا لەقیامەتدا ئەنواو جێگایان جەهەننەمەو, ئەویش چارەنووسێکی نالەبارو خراپە ﴿[٩٨] إلا المستضعفين من الرجال والنساء والولدان﴾ ئەوپیاوو ژن و منداڵانە نەبێ ﴿لا يستطيعون حيلة﴾ کە توانای هیچ خۆدەربازکرد,نێکیان نییە ﴿ولا يهتدون سبيلا﴾ و شارەزای ڕێگەش نین و ڕێ دەرناکەن ﴿[٩٩] فأولئك عسى الله أن يعفو عنهم﴾ جاخوا بێگومان خوا لەوانە ئەبووری ﴿وكان الله عفوا غفورا﴾ و خوا هەمیشە گوناه پۆشی لێبوردەیە، لەخاوەن بیانوانیش بیانوو وەردەگرێت.

**ڕێنماییەکانی ئایەتی (٩٥-٩٦):**

١- فەزڵی موجاهید بەسەر ئەوکەسانەدا جیهاد ناکەن ودانیشتوون حەتمیە.

٢- بڕواداری خاوەن پۆزش و بەبیانوو، کرێ و مزەی موجاهیدانی گۆڕەپانیان هەیە، بەمەرجێ توانایان نەبووبێ بچنە غەزاو لەدڵیشەوە حەزیان لێکردبێ, پێغەمبەریش ﷺ کاتێ موسڵمانەکان لەغەزای (تەبووك) بوون و هەندێ هاوەڵان بەهۆی نەخۆشیەوە جێمابوون لەوبارەیەوە فەرمووی: ((إن بالمدينة رجالا ماقطعتم واديا، ولا سرتم مسيرا إلا كانوا معكم حبسهم المرض)) بوخاریی. واتە: پیاوگەلێ لەمەدینەدا بەهۆی نەخۆشیەوە جێماون، دڵنیابن ئێوە هەرشیوو دۆڵێ دەبڕن ئەی موجاهیدان! ئەوانە شەریك و هاوبەشتانن. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا موجاهیدانی فیعلیی سەر گۆڕەپان, پلەی تایبەتی خۆیانیان هەیە.

**کۆچ بکە بۆ خوا، دەکەویتە فەرحانەوە:**

﴿[١٠٠] ومن يهاجر في سبيل الله﴾ هەرکەسێك لەبەردینی خوا لەزێدی خۆی کۆچ بکات ﴿يجد في الأرض مراغما كثيرا وسعة﴾ لەو وڵاتەدا کەبۆی دەچێ گەلێ جێگاو شوێنی باشی حەوانەوەی بۆدەبێ و دەکەوێتە فەرەحانییەوە. (تەبەریی) لە(ئیبن عەباس)ـەوە دەگێڕێتەو دەڵێت: کاتێ ئایەتی: (إن الذين توفاهم الملائكة..) هاتە خوارێ، پیاوێك لە مەککەدا بەهۆی نەخۆشیەوە نەیتوانیبوو کۆچ بکا، جا لەترسی ئەوە کە لە (دار الكفر)دایە, بەخزم و کەس وکارەکەی وت: تکاتان لێدەکەم بەزوویی لەمەککە بمبەنە دەرێ و.. بەرەو مەدینە بەڕێم بکەن، لەریوایەتێکی تردا هاتووە: بەڕێکەوت بۆ مەدینە، بەڵام پێش ئەوە بەپێغەمبەر ﷺ بگا لەمەدینە، لەرێگادا گیانی سپارد، جا لەوبارەیەوە ئەم ئایەتە هاتەخوارێ و فەرمووی: ﴿ومن يخرج من بيته مهاجرا إلى الله و رسوله﴾ و هەرکەسێك لەماڵی

خۆی دەرچێ و کۆچ بکا بۆلای خواو پەیامبەرەکەی ﷺ ﴿ثم یدرکه الموت﴾ پاشان لەرێدا مردنی پێگەیشت، پێش ئەوەی بگاتە ئەوجێگایەی بۆی دەچێ ﴿فقد وقع اجره علی الله﴾ ئەوە بێگومان پاداشی کەوتۆتە سەرخواو مسۆگەر دەبێت ﴿وکان الله غفورا رحیما﴾ و خوایش هەمیشە تاوانپۆشی میهرەبانە.

رێنماییەکانی ئایەتی (٩٧-١٠٠):

١- هەرکات بڕواداران رێی و شوێنی خواپەرستیان لێبەسرا، دەبێ لەوجێگایە هیجرەت بکا بۆ وڵاتێکی تر کەبتوانێ لەوێ بەئازادانە خواپەرستی بکات.

٢- مانەوە لە (دارالکفر) و هیجرەت نەکردن تێیدا, بەگوناحی گەورە دانراوە.

٣- کەسێك جیهادی لەکۆڵ بکەوێ، هەرئاوا هیجرەتیشی لەسەر لادەچێ.

٤- کەسێ لەماڵ دەرچووو پاشان لەرێگادامرد, ئەوە پاداشی کاملی هەیە، (ئیبن عەباس) ئەڵێ: (زەمورەی کوڕی جوندوب) کۆچی کرد بۆلای پێغەمبەرﷺ بەڵام بەرلەوە بگات لای لەرێگەدا مرد، ئەوسا ئایەتی: (ومن یخرج من بیته..) هات. کۆچ ئەوەیە کە: لەشارو ئاوایی کافرەکانەوە کەسێ بچیت بۆ وڵات و ئاوایی موسڵمانان، دیارە ئەم کۆچەش بەفەرز دانراوە. بۆ بارکردنیش هۆگەلی هەیە، بۆنموونە: ئیمامی (مالیك) ئەڵێ: لەهەرجیگایەك جنێو بە(سەلەف) و پێشینانمان بدرێ، نابێ لەوجێگایە دابنیشی.

٥- لەهەر وڵاتێ حەرامخۆریی زاڵبوو بەسەر حەڵاڵ خۆریدا هیجرەت پێویستە.

٦- هەر موسڵمانێ لەخۆی، یا لەماڵ و منداڵو شەرەفی دەترسا, دەبێ هیجرەت بکات.

٧- هەر وڵاتێك زانایەکی وای تێدا نەبێ شارەزای ئەحکامەکانی دینی خوابێت, پێویستە لەوێ دەرچێ.

**کورتکردنەوەی نوێژەکان:**

﴿١٠١ وإذا ضربتم فی الأرض فلیس علیکم جناح ان تقصروا من الصلاة﴾ کاتێ بە سەفەر چوون بەوڵاتدا - بۆ جیهاد، یان بۆ بازرگانیی- ئەوە لەحاڵی وادا هیچ گوناهێکتان لەسەر نابێ, کە نوێژە چوار رکاتیەکان کورت بکەنەوە ﴿إن خفتم ان یفتنکم الذین کفروا﴾ ئەگەر ترستان بوو بێباوەڕەکان تووشی پیلانێکتان بکەن: (بتانکوژن، بتانگرن ئازارتان بدەن). جا بۆدوایی خەڵکە موسڵمانەکە هاتنە لای پێشەوا عومەر ﷺ وتیان: خۆ ئێستا ترسمان نەماوە، ئاخۆ هەرئەتوانین نوێژەکان کورت بکەینەوە؟ ئەویش فەرمووی: منیش هەمان پرسیارم لەپەیامبەرﷺ کردو لەوەڵامدا فەرمووی: ((صدقة تصدق الله بها علیکم فأقبلوا صدقته)) پێشەوا ئەحمەد. واتە: ئەوە صەدەقەو میهرەبانیەکی خوابوو لەگەڵ ئەم ئوممەتەدا کردی، دەسا ئێوەش لێی وەرگرن, بێ لەمەیش لەو سەردەمەدا زۆرینەی خەڵك دەچوونە سەفەر بەمەبەستی خۆپاراستن وخۆحەشاردان لەکافرەکان وخۆدزینەوە لە جیهاد، بۆیە ترس لەکافران، دەکاتە هۆی کورتکردنەوەی نوێژەکان، جابۆیە پێچەوانەکەی وەرناگیرێ، واتە: هەرکە ترسەکە نەما، نوێژەکەش کورت نەکرێتەوە، بۆبەڵگەی ئەمە ئوصولییەکان دەڵێن: (والمنطوق إذا خرج مخرج الغالب، أوعلی حادثة فلا مفهوم له، کقوله تعالی: (ولا تکرهوا فتیاتکم علی البغاء إن أردن تحصنا..). ﴿إن الکافرین کانوا لکم عدوا مبینا﴾ بەراستیی بێ باوەڕان هەمیشە بەئاشکرا دوژمنتانن.

**نوێژی ترس و شێوەی کردنەکەی:**

(ئیبن کەسیر) لە (ئەبووعەییاش)ەوە -کەپێشەوا (ئەحمەد، حاکم، ئیبن جەریر) ریوایەتی دەکەن- ئەگێڕێتەوەو دەڵێ: لەگەڵ پەپیامبەری خوادا ﷺ لە(عوسفان)دا نوێژی نیوەڕۆمان دەکرد، بێ باوەڕەکانیش بەسەرۆکایەتی

(خالیدی کوڕی وەلید) لەبەر دەممان‌دا (لەلای ڕووگەوە) بوون، جا کە دیتیان وائێمە خەریکی نوێژین وتیان: خۆزگە هەرئێستا بەیەکدەست دەمانداا بەسەریاندا !! پاشان وتیان: خۆ بەینێکی تر کاتی نوێژی تریان دێت، خۆ ئاشکرایە کەموسڵمانەکان نوێژیان لەخۆیان و لەماڵ و منداڵیان خۆشتردەوێ، (عەیاش) دەڵێ: لەنێوان نوێژی نیوەڕۆو عەسردا (جوبریل) ئەم ئایەتەی هێناو فەرمووی: ﴿[١٠٢] وإذا كنت فيهم فأقمت لهم الصلاة﴾ کاتێ لەناوهاوەڵانتدا بوویت ئەی پێغەمەر!ﷺ واتە: لەسەفەردا, ئینجا ویستت نوێژی بەکۆمەڵیان بۆبکەیت و, کاتی ڕووبەڕووبوونەوەش بوو لەگەڵ کافراندا ﴿فلتقم طائفة منهم معك﴾ با دەستەیەکیان لەگەڵت هەڵسن ونوێژ دابەستن، ئەوانی تریشیان لەرووی دوژمن رابووەستن، واتە: ئەگەر دوژمن لەنێوان ئێوەو قیبلەدابوو, هاوەڵەکانت بکە بەدوودەستەوە ﴿وليأخذوا اسلحتهم﴾ ودەبێ هەموو -نوێژخۆین و پاسەوان- چەکەکانیان بەدستەوە بگرن ﴿فإذا سجدوا فليكونوا من ورائكم﴾ جا کاتێ ئەم دەستە کە لەگەڵ تۆ سوژدە دەبەن، بە پەلە بچن لەدوای ئێوەوە رابووەستن و پارێزگاریتان بکەن، واتە: دەستەی یەکەم رکاتێک لە نوێژەکەیان لەگەڵ تۆ دەکەن, ئەوسا بەپەلە جیا دەبنەوەو بۆخۆیان و ئەوی تری تەواودەکەن ودەبنە پاسەوان ﴿ولتأت طائفة اخرى لم يصلوا﴾ ودەبێ ئەو دەستەکەی تر کەهێمان نوێژیان نەکردووەو پاسەوانن بێنە پێش ﴿فليصلوا معك﴾و لەگەڵ تۆدا نوێژ بەجەماعەت بکەن ﴿وليأخذوا حذرهم واسلحتهم﴾ ودەبێ وریایی خۆیان وەرگرن و چەکەکانیشیان بەدەستەوە بگرن ﴿ود الذين كفروا لو تغفلون عن اسلحتكم وامتعتكم﴾ و بێ باوەڕەکان پێیان خۆشە کە ئێوە -بەهۆی نوێژەکەتانەوە- لەچەك و کەلوپەلەکانتان غافڵ و بێ ئاگا بن ﴿فيميلون عليكم ميلة واحدة﴾ ئەوسا ئەوانیش بەیەك دەست پەلامارتان بدەن و هێرش بێننە سەرتان، کەوابوو نابێ هەموو بەیەکجار پێکەوە نوێژ بکەن، بەڵکو دەبێ دەستەیەك بەچەکەوە پاسەوانتان بن هەتا لێدەبنەوە ﴿ولا جناح عليكم إن كان بكم اذى من مطر أو كنتم مرضى﴾ وە ئەگەر نارەحەتیی و ئازارێکتان هەبوو وەکو باران, یان نەخۆش وبریندار بن, ئەوە لەوکاتانەدا هیچ گوناهتان لەسەر نییە ﴿ان تضعوا اسلحتكم﴾ چەکەکانتان دانێن لەکاتی نوێژەکاندا ﴿وخذوا حذركم﴾ و هەردەبێ هۆشیاریی و وریایی خۆتان وەرگرن ، واتە: تا ئەتوانن ئامادە باش بن بۆ دوژمن و خۆتان بپارێزن لێیان ﴿إن الله أعد للكافرين عذابا مهينا﴾ دیارە کەخوا بۆ بێ باوەڕەکان سزایەکی ئابڕووبەروو ریسواکەری ئامادە کردووە. بەڵێ خوای گەورە و دلۆڤان لەبەر باران و هەرشتێکی تری دژوار مۆڵەتی موسڵمانان دەدا چەکەکانیان لەشان داگرن، بەڵام لەوکاتەشدا هەردەبێ هوشیارو وریابن، کەوابوو ئەگەر موسڵمانان هەمیشە ئامادەباش بن بۆجیهاد خوای بە دەسەڵات کافران دەشکێنێ و ریسوایان دەکات.

الجزء الخامس — سورة النساء

وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ
مِّنْهُم مَّعَكَ وَلْيَأْخُذُوٓاْ أَسْلِحَتَهُمْ فَإِذَا سَجَدُواْ فَلْيَكُونُواْ
مِن وَرَآئِكُمْ وَلْتَأْتِ طَآئِفَةٌ أُخْرَىٰ لَمْ يُصَلُّواْ
فَلْيُصَلُّواْ مَعَكَ وَلْيَأْخُذُواْ حِذْرَهُمْ وَأَسْلِحَتَهُمْ وَدَّ ٱلَّذِينَ
كَفَرُواْ لَوْ تَغْفُلُونَ عَنْ أَسْلِحَتِكُمْ وَأَمْتِعَتِكُمْ فَيَمِيلُونَ
عَلَيْكُم مَّيْلَةً وَٰحِدَةً وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن كَانَ بِكُمْ
أَذًى مِّن مَّطَرٍ أَوْ كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَن تَضَعُوٓاْ أَسْلِحَتَكُمْ
وَخُذُواْ حِذْرَكُمْ إِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا ﴿١٠٢﴾
فَإِذَا قَضَيْتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ
جُنُوبِكُمْ فَإِذَا ٱطْمَأْنَنتُمْ فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ
كَانَتْ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ كِتَٰبًا مَّوْقُوتًا ﴿١٠٣﴾ وَلَا تَهِنُواْ
فِى ٱبْتِغَآءِ ٱلْقَوْمِ إِن تَكُونُواْ تَأْلَمُونَ فَإِنَّهُمْ يَأْلَمُونَ كَمَا
تَأْلَمُونَ وَتَرْجُونَ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا يَرْجُونَ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا
حَكِيمًا ﴿١٠٤﴾ إِنَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ
ٱلنَّاسِ بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُ وَلَا تَكُن لِّلْخَآئِنِينَ خَصِيمًا ﴿١٠٥﴾

٩٥

**دوای نوێژی ترس یادی خوا زۆر بکەن:**

﴿١٠٣ فإذا قضيتم الصلاة﴾ جا هەرکات لەنوێژەکەتان دەبنەوە ﴿فاذكروا الله قياما وقعودا وعلى جنوبكم﴾ دەسا بەڕاوەستان و بەدانیشتنەوەو بەڕاکشان و لەسەر تەنیشت یادی خوا بکەن، بەشکو خوا سەرتان بخات ﴿فإذا اطمأننتم فأقيموا الصلاة﴾ جا کاتێ دڵنیادەبن و ترستان نامێنێ، ئیتر بەئاسایی وەك جاران نوێژەکانتان ئەنجام بدەن ﴿إن الصلاة كانت على المؤمنين كتابا موقوتا﴾ بەڕاستی نوێژ لەسەر باوەڕداران فەرزێکە، کات و شێوەی کردنەکەی لای خوا دیاریکراوە، ئەگەر حاڵەتێکی نائاسایی پەیدا نەبوو نابێ لێی لابدرێت. لەم ئایەتەدا کات بۆئەنجامدانی نوێژەکان دیاری نەکراوە، بەڵام لەسوورەتی (ئیسراء: ٧٨)دا: (أقم الصلاة لدلوك الشمس إلى غسق اليل و قرآن الفجر إن قرآن الفجر كان مشهودا) وە لەسوورەتی (ڕووم: ١٧-١٨)دا: (فسبحان الله حين تمسون و حين تصبحون وله الحمد فى السموات و الأرض وعشياو حين تظهرون) وە لەسوورەتی (هوود: ١١٤): (واقم الصلاة طرفى النهار وزلفامن اليل) وەختەکەیان دیاریکراوەو، پێغەمبەریش ﷺ لەگەڵ (جبریل) دا هەردوو پێکەوە لەکاتی خۆیدا نوێژیان کرد.

بەڵێ.. پێشخستن و دواخستنی نوێژەکان لەکاتی دیاریکراویاندا, واتە: (جەمعە تەقدیم و جەمعە تەئخیر) ڕێی پێدراوە, وەك پێشەوا (موسلیم) هێناویەتی لەباسی (حەج)دا: ((ثم أذن ثم أقام فصلى الظهر، ثم أقام فصلى الظهر، ولم يفصل بينهما شيئا) ئەبوو داودو پێشەوا ئەحمەد وتیرمزیی و ئیبنی حیببان و دارە قوتنی و بەیهەقی و حاکیم لە(موعان)ەوە ڕیوایەت ئەکەن و دەڵێن: ((إن النبي ﷺ كان إذا ارتحل قبل أن تنزغ الشمس اخر الظهر حتى يجمعها إلى العصر، يصليهما جميعا، وإذا ارتحل بعد بزوغ الشمس صلى الظهر والعصر جميعا ثم سار، وكان إذا ارتحل قبل المغرب اخر المغرب حتى يصليها مع العشاء وإذا ارتحل بعد المغرب عجل العشاء فصلاها مع المغرب)). ئیبن عباسیش ئەڵێت: ((أنه ﷺ كان في السفر إذا زاغت الشمس من منزله جمع بين الظهر والعصر قبل أن يركب، فإذا لم تزغ في منزله سار حتى إذا حانت العصر نزل فجمع بين الظهر والعصر، وإذا حانت المغرب في منزله جمع بينها وبين العشاء، وإذا ارتحل في منزله ركب حتى إذا كانت العشاء نزل فجمع بينهما) رواه أحمد والشافعي في مسنديهما..(عن أنس: كان النبيى ﷺ إذا رتحل قبل أن تزيغ الشمس أخر الظهر إلى وقت العصر، ثم جمع بينهما، وإذا زاغت صلى الظهر ثم ركب)) بوخاری/ح١١١١.

**ڕێنماییەکانی ئایەتی (١٠١- ١٠٣):**

١- پێغەمبەر ﷺ زۆر جاران هەم بەقسە، هەم بەکردەوە دووپاتی کورتکردنەی نوێژەکانی دەکردەوە، بەڵام زاناکانمان لەمەدا قسەیان جیاوازە کە: ئاخۆ ئەو کورتکردنەوەیە واجیبە، یا سوونەتە؟ هەندێ دەڵێن: واجیبە، چون خاتووعائیشە ئەڵێ: ((فرضت الصلاة ركعتين ركعتين))، بەڵام جەماوەری زانایان پێیان وایە کە: کورتکردنەوە (سوننەت)ـە. هەندێکی دیکەش ئەڵێن: ئەوکەسە بەئارەزووی خۆیەتی: دەتوانێ کورتی کاتەوە. دەشتوانێ بەئاسایی بیکا، بەڵام قسەی پەسەندیان ئەمەیە کە: کورتکردنەوە سوونەتێکی (مۆکدە)و دوپات کراوەیە.

٢- نوێژی ترس و شێوەی کردنەکەیشی دانی پێدانراوە.

٣- گەورەیی نوێژ بەجەماعەت، تەنانەتی لەکاتی ترس و جەنگیشدا ئەنجام دراوە.

٤- ناوهێنانی خوا هەمووکات سوننەتە بەتایبەتی لەکاتی ڕووبەڕووبوونەوەدا.

٥- نوێژ فەرزەو کاتەکەشی دیاریکراوە، وەکو حەج فەرزەو کاتی خۆی هەیەو نابێ لێی لابدرێت.

٦- موسافیر دەبێ لەشوورەی گوندەکەی، یان شارەکەی دەرچێ ئەوجار دەتوانێ نوێژەکان کورت بکاتەوە.

٧- گەر ڕێبوارێك لەپشت ئیمامێکی تەواوکەری نوێژەوە نوێژی دابەست بەجەماعەت، دەبێ ئەویش وەك ئەوئیمامە نوێژەکەی تەواوکا، بەڵام ئەگەر کەسێك (موقیم) بوو و نوێژی لەتەك ئیمامێکی موسافیر کرد، قەیدی نییە، بەڵام بۆدوایی دەبێ خۆی تەواوی بکا.

**لە بەدوادا چوونی دوژمندا سستی مەکەن:**

﴿[104] ولا تهنوا فی ابتغاء القوم﴾ لە بەدواداچوون و ڕاونانی لەشکری کوفرو دوژمندا سست و کەمتەرخەم مەبن، دەبێ هەموو کون و قوژبنێکیان لێبگرن، پێشەوا (قورتوبیی) ئەڵێت: ئەم ئایەتە لەجەنگی ئوحددا هاتە خوارێ، ئەودەمەی پەیامبەری خوا ﷺ فەرمانی دا کە شوێنی بێ باوەڕەکان کەون و ڕاویاننێن لەهەمانکاتدا موسڵمانانەکانیش بەخەستی بریندار ببوون. بڕیاریش بوو هەر ئەوانە لەگەڵیان بچن کە لەجەنگی ئوحوددا بەشدار ببوون پاشان ئەم ئایەتە هات وفەرمووی: ﴿إن تکونوا تألمون فإنهم یألمون کما تألمون﴾ واتە: ئەگەر ئێوە لەوانەوە تووشی ئێش و ئازارو برینداری و ناڕەحەتی بن، بێگومانبن ئەوانیش هەروەکو ئێوە توشی جەنڕەبە ئەبن کەچی ئەوان ئارامیان هەیە وکۆڵنادەن، کەوابوو دەبێ ئێوە باشتر خۆڕاگربن و ڕاویان بکەن، چونکە: ﴿وترجون من الله مالا یرجون﴾ ئێوە ئومێدتان خوایە، بەتەمان لەلایەن خواوە دەستکەوتان هەبێت، ئەوان بەتەمای ئەوەش نین، واتە: ئێوە بەتەمای پاداشی قیامەتن، ئەوان بەتەمای نین ﴿وکان الله علیما حکیما﴾ خوا هەموو وەختێ بەو ناڕەحەتیەی دووچارتان دەبێت زانایە، کار ڕەوایە، لەوشتانەدا فەرمانتان پێدەکات، وەکو خۆی لەجێگایەکی تردا ئەفەرموێ: (ولا تهنوا ولا تحزنوا وانتم الأعلون إن کنتم مؤمنین، إن یمسسکم قرح فقد مس القوم قرح مثله ..) (آل عمران ١٣٩-١٤٠).. یان دەفەرموێ: (فلا تهنوا وتدعوا إلی السلم وانتم الاعلون والله معکم ولن یترکم أعمالکم) (محمد:٣٥).

**هەر بەقورئان حوکم بکە:**

پیاوێك بەناوی (توعمەی کوڕی ئوبەیریق)ـەوە کڵاوخوودەیەکی لەماڵی (قەتادە)ـی دراوسێیدا دزیی و لەلای (زەید)ی جوولەکەدا شاردیەوە، پاشان گومان خرایە سەر توعمەو داوای خوودەکەی لێکرا، ئەوسا ئەویش سوێندی خوارد کە نەیبردووەو ئاگایشی لێی نییە، بەڵام بۆدوایی لای جوولەکەکە دۆزرایەوە، ئەویش ڕتی: توعمە لێرە داینـاوە، خەڵکێکیش لەجوولەکەکان شایەدیان بۆ داو کەوتە سەر توعمە، ئینجا هۆزەکەی توعمە (بني زەفەر) چوونە لای پێغەمبەر ﷺ تا بەرگری لەم بکەن و بیخەنە سەر جوولەکەکە، پاشان ئایەتی (إنا أنزلنا ..) هات و دزیەکە کەوتە سەر توعمەو لەترسا هەڵهات بۆ مەککە و لەئایین وەرگەڕا، ئەوسا پاش ماوەیەك لەوێیش چوو بۆ دزیی و دیوارێکی کون کردو، دیوارەکە کەوت بەسەریاو مرد. ﴿[105] إنا أنزلنا إلیك الکتاب بالحق﴾ ئێمە ئەم قورئانەمان بۆ تۆ ناردووە کە بێگومان هەمووی ڕاست و هەقە ﴿لتحکم بین الناس بما أراك الله﴾ ساتۆیش بەم قورئانە هەروەك خوا ڕێی پێ نیشان داویت دادپەروەرانە داوەری مەردم بکە ﴿ولا تکن للخائنین خصیما﴾ و مەبە پشتیوان و لایەنگر بۆ گزیکاران و خائینان و ناپاکان ﴿[106] واستغفرالله﴾ و بەردەوام لەخوا داوای لێبوردن بکە لەهەر نیازێك کە بەدڵتا بێت لەبارەی پشتیوانی کردنی خائینانەوە، ئەگەرچی بە بەرژەوەندیت دانابێت و نیازێك بەدڵتا هاتبێت ﴿إن الله کان غفورا رحیما﴾ بەڕاستی خوا هەمووکات زۆرلێبوردەو، دلۆڤان و میهرەبانە ﴿[107] ولاتجادل عن الذین یختانون انفسهم﴾ قەت بەرگری لەوکەسانە مەکە، کەتەنانەتی لەگەڵ خۆشیان خیانەتیان کردووە، وەکو (ئوسەیدی کوڕی عوروە) کە بەهۆی دزیی و خواردنی ماڵە سپاردەکەوە سەرپێچی لەخوا کرد ﴿إن

الله لایحب من کان خوانا اثیما﴾ بەراستیی خوا حەز ناکا لەچارەی ئەوکەسانە گزییکارو گوناهبارن، ئەی ئیتر چۆن دەبێ موسڵمان بەرگریی لەخائینان و گوناهبارن بکا؟! ﴿یستخفون من الناس﴾ ئەو دووڕووانە تاوان لەمەردوم ئەشارنەوەو شەرم دەکەن لێیان ﴿ولا یستخفون من الله﴾ کەچی لەوخوا گەورەیە شەرم ناکەن ئەو کابرا دزە، شتە دزراوەکەی لەخەڵك دەشاردەوە، بەلاّم لەخوا شەرمی نەدەکرد! ﴿وهو معهم إذ یبیتون ما لایرضی من القول﴾ بەمەرجێ هەموو وەختێ خوا لەگەڵیانەو ئاگاداریانە. بەتایبەتی ئەو دەمەی کەئەوان بەشەودا قسانێکیان دەکرد کەهەرگیز (خوا) پێی رازی نییە ﴿وکان الله بما یعملون محیطا﴾ خۆ هەرکارێك ئەوان بیکەن، بێگومانە کەخوا لێی بەئاگایەو، ناتوانن هیچ شتێکی لێ بشارنەوەو، تۆڵەو پاداشیشیان ئەداتەوە ﴿١٠٩ هاانتم هؤلاء جادلتم عنهم فی الحیاة الدنیا﴾ وا ئێوە گریمان هەتا لەسەر دنیا بن (ئەی هۆزی توعمە!) توانیتان لەو دزو خائینانە وەك (توعمەی ئوبەیریق) پشتیوانی بکەن ﴿فمن یجادل الله عنهم یوم القیامة﴾ باشە! ئەی لە دواڕۆژدا کێ دەتوانێ لەبەرامبەر خواوە راوەستێ و، لەسەریان بکاتەوە ﴿ام من یکون علیهم وکیلا﴾ یان کێ هەیە لەو رۆژەدا پارێزگارو پشتیوانیان بێت و کارەکەیان لەئەستۆ بگرێ؟ دیارە هیچ کەس نییە، جاکەوایە هەرگیز دیفاع لەناهەقیی مەکە.

رێنمایەکانی ئایەتی (١٠٥-١٠٩):

١- حوکم و بڕیاردان بە غەیری قورئان و سوننەت کوفرە.

٢- پشتیوانی لەستەمکاران و تاغووتان و گزیکاران حەرامە.

٣- داواکردن لەخوا بۆبەخشینی تاوانەکان، چ بچوك چ گەورە کارێکی پیرۆزو پێویستە.

٤- رق و قین لەتاوانکاران و پیاوخراپان ڕق و قینێکی پیرۆزە.



وَٱسْتَغْفِرِ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٠٦﴾ وَلَا تُجَٰدِلْ عَنِ ٱلَّذِينَ يَخْتَانُونَ أَنفُسَهُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ خَوَّانًا أَثِيمًا ﴿١٠٧﴾ يَسْتَخْفُونَ مِنَ ٱلنَّاسِ وَلَا يَسْتَخْفُونَ مِنَ ٱللَّهِ وَهُوَ مَعَهُمْ إِذْ يُبَيِّتُونَ مَا لَا يَرْضَىٰ مِنَ ٱلْقَوْلِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطًا ﴿١٠٨﴾ هَٰٓأَنتُمْ هَٰٓؤُلَآءِ جَٰدَلْتُمْ عَنْهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا فَمَن يُجَٰدِلُ ٱللَّهَ عَنْهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ أَم مَّن يَكُونُ عَلَيْهِمْ وَكِيلًا ﴿١٠٩﴾ وَمَن يَعْمَلْ سُوٓءًا أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُۥ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ ٱللَّهَ يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١١٠﴾ وَمَن يَكْسِبْ إِثْمًا فَإِنَّمَا يَكْسِبُهُۥ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١١١﴾ وَمَن يَكْسِبْ خَطِيٓـَٔةً أَوْ إِثْمًا ثُمَّ يَرْمِ بِهِۦ بَرِيٓـًٔا فَقَدِ ٱحْتَمَلَ بُهْتَٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴿١١٢﴾ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكَ وَرَحْمَتُهُۥ لَهَمَّت طَّآئِفَةٌ مِّنْهُمْ أَن يُضِلُّوكَ وَمَا يُضِلُّونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ ۖ وَمَا يَضُرُّونَكَ مِن شَىْءٍ ۚ وَأَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَعَلَّمَكَ مَا لَمْ تَكُن تَعْلَمُ ۚ وَكَانَ فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكَ عَظِيمًا ﴿١١٣﴾



٥- وە بیرهێنانەوەی رۆژەکانی قیامەت بەپەندو ئامۆژگاریی.

**هەر هەڵەیەکت کرد تەوبەی لێ بکە:**

﴿١١٠ ومن یعمل سوءا او یظلم نفسه﴾ هەرکەسێکیش هەرکارێکی خراپ و نالەبار بکات دزیی، یان هەرچی تر وەیان ستەم لەخۆی بکات ﴿ثم یستغفر الله﴾ پاشان لەخوا داوا بکا لێی ببوورێ ﴿یجدالله غفورا رحیما﴾ ئەوا دەبینێت کەخوا زۆر لێبوردەو میهرەبانە ﴿١١١ ومن یکسب إثما﴾ هەرکەسێك هەر گوناحو تاوانێك بکا ﴿فإنما یکسبه علی نفسه﴾ دیارە زیان و ئۆباڵەکەی تەنها لەسەرخۆی دەکەوێ، واتە: خۆی گیرۆدە ئەبێت، وەك خوای گەورە لەجێگایەکی تردا ئەفەرموێ: (ولا تکسب کل نفس إلا علیها ولا تزر وازرة وزر اخری) (الأنعام: ١٦٤) یان دەفەرموێ: (ومن أساء فعلیها ..) (الجاثیة: ١٥). ﴿وکان الله علیما حکیما﴾ بێگومان خوا هەمووکات زاناو بەئاگایە

لەوكەسانەی گوناح دەكەن، كاربەجیّ و لەكارزانە تۆڵە تەنها لەوكەسە دەسێنێت كە گوناهەكەی كردووە ﴿١١٢﴾ ومن یكسب خطیئة او إثما﴾ هەركەسێك بەهەڵە یان بەقەست، تاوانێكی لیّ رووبدات، ئیتر ئەو تاوانە بچوك بێت یان گەورە ﴿ثم یرم به بریئا﴾ لەپاشان بیخاتە سەر بیّ تاوانێك و پێی مجرۆ بكات ﴿فقد احتمل بهتانا وإثما مبینا﴾ بێگومان ئەوكەسە باریّ درۆو گوناحی ئاشرای لەكۆڵ خۆی ناوە ﴿١١٣﴾ ولولا فضل الله علیك ورحمته﴾ خۆئەگەر فەزڵ و میهرەبانی و رەحمەتی خوا بەهانای تۆ نەهاتبایە ئەی پێغەمبەر ﷺ! ﴿لهمت طائفة منهم ان یضلوك﴾ دەستەیەك لەوانە تەماعیان تێكردبوویت گومڕات بكەن، واتە: دەیانویست تۆ پشتگیریی لەتاوانباران بكەیت، ئەوەبوو دووروەكان ویستیان توعمەی ئوبەیرقی مونافیق و دووڕوو و دز رزگار ببیّ و، كابرای جوولەكەی بیّ تاوان تێوەبگلێت، بەڵام خوای گەورە نەیهێشت ئەوە رووبدا ﴿وما یضلون إلا انفسهم﴾ خۆمەگەر هەرخۆشیان بەوكارە گومڕاو لاڕیّ بكەن ﴿وما یضرونك من شئ﴾ دڵنیاشبە ئەوان ناتوانن هیچ جۆرە زیانێكت پێبگەیەنن، چونكە خوا پشتیوانتەو ئەتپارێزێت ﴿وانزل الله علیك الكتاب و الحكمة﴾ لەگەڵ ئەوەیشدا خوا قورئان و وردەكاریی و حیكمەتی بۆناردیت و، واتە: ئەوانە چۆن ئەتوانن سەر لەتۆ تێك بدەن ﴿وعلمك مالم تكن تعلم﴾ زۆر شتی فێر كردی كەپێشتر نەتدەزانی، وەكو بەرنامەی پەیامبەرانی پێش خۆت و، چەندان كاری تری گرنگ و مەزن ﴿وكان فضل الله علیك عظیما﴾ تۆش هەمیشە چاكەو میهرەبانی زۆر گرنگت لەخواوە لەگەڵ كراوە.



الحزب ١٠

۞ لَّا خَيْرَ فِي كَثِيرٍ مِّن نَّجْوَاهُمْ إِلَّا مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ
أَوْ مَعْرُوفٍ أَوْ إِصْلَاحٍ بَيْنَ النَّاسِ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ
ابْتِغَاءَ مَرْضَاتِ اللَّهِ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١١٤﴾ وَمَن
يُشَاقِقِ الرَّسُولَ مِن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ الْهُدَىٰ وَيَتَّبِعْ غَيْرَ
سَبِيلِ الْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصْلِهِ جَهَنَّمَ ۖ وَسَاءَتْ
مَصِيرًا ﴿١١٥﴾ إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ
ذَٰلِكَ لِمَن يَشَاءُ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا بَعِيدًا
﴿١١٦﴾ إِن يَدْعُونَ مِن دُونِهِ إِلَّا إِنَاثًا وَإِن يَدْعُونَ
إِلَّا شَيْطَانًا مَّرِيدًا ﴿١١٧﴾ لَّعَنَهُ اللَّهُ ۘ وَقَالَ لَأَتَّخِذَنَّ
مِنْ عِبَادِكَ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا ﴿١١٨﴾ وَلَأُضِلَّنَّهُمْ وَلَأُمَنِّيَنَّهُمْ
وَلَآمُرَنَّهُمْ فَلَيُبَتِّكُنَّ آذَانَ الْأَنْعَامِ وَلَآمُرَنَّهُمْ
فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلْقَ اللَّهِ ۚ وَمَن يَتَّخِذِ الشَّيْطَانَ وَلِيًّا
مِّن دُونِ اللَّهِ فَقَدْ خَسِرَ خُسْرَانًا مُّبِينًا ﴿١١٩﴾
يَعِدُهُمْ وَيُمَنِّيهِمْ ۖ وَمَا يَعِدُهُمُ الشَّيْطَانُ إِلَّا غُرُورًا ﴿١٢٠﴾
أُولَٰئِكَ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَلَا يَجِدُونَ عَنْهَا مَحِيصًا ﴿١٢١﴾



**زۆرینەی سرپەو چرپە بیّ هوودەیە:**

﴿١١٤﴾ لاخیر فی كثیر من نجواهم﴾ زۆربەی سرتە سرت و چپەكانیان هیچ خێرو بەهرەیەكی تێدا نییە، مەبەست لە چپە و نهێنییەكانی (هۆزی بەنی ئوبەیریق)ـە. ئەوەبوو خڕ دەبوونەوەو راوێژیان دەكرد كە: چۆن (توعمە) لەوكارە دزێوە بپەرێننەوە، بەڵام كەڵكی نەبوو بۆیان، پاشان قورئانی پیرۆز رێی لەهەموو پیلان وسرتە سرتێك گرت، وەك فەرمووی: (لا خیر فی كثیر من نجواهم). لەگەڵیّ جێگای تردا هاتووە كە ڕیّ نەدراوە بەهەر قسەو باسێك بەنهێنی بكرێت، مەگەر قسەو باسێك بەرژەوەندی موسڵمانانی تێدا بێت، وەك ئایەتی: (یاأیهاالذین آمنوا إذا تناجیتم فلا تتناجوا بالإثم والعدوان ومعصیة الرسول وتناجوا بالبر والتقوی واتقوالله الذی إلیه تحشرون * إنما النجوی من الشیطان ..) (المجادلة: ١٠-٩) ﴿إلا من امر بصدقة او معروف او إصلاح بین الناس﴾ جا مەگەر كەسێك فەرمان بدات بەصەدەقەو كاری چاكەو پێك هێنانەوەی مەردمو فەرمان بدا بەناوبژیی و ئاشتبوونەوەی نێوان خەڵك بۆئەم كارانە بەهەرجۆر راوێژو چپە بكریّ و، بەنهێنی هەنگاو بنرێت، هەر خێرو چاكەیە، واتە: هەر كۆڕو كۆبوونەوەیەك كە ساز دەدریّ بۆئەنجامدانی ئەوكارانە زۆر باش وپەسەندە. بەڵیّ ئەگەرچی لەم جێیەدا ئەو ئیصلاح و رێكخستنە

نێوان گشت مەردم دەگرێتەوە، بەڵام لەچەند جێیەکی تردا ئەو ئیصلاح و ڕێکخستنەیە دیاریکراوە کە، مەبەست پێی چاککردنی نێوان موسڵمانانە، هەروەك لەسوورەتی (الحجرات: ١٠)دا ئەفەرموێ: (إنما المؤمنون إخوة فأصلحوا بين أخويكم) دیسان هەر لەئایەتی (٩)ی هەمان سورەت: (وإن طائفتان من المؤمنين اقتتلوا فأصلحوا بينهما) هاتووە، هەروەك لەسورەتی (الأنفال: ١)دا دەفەرموێ: (.. فاتقواالله وأصلحوا ذات بينكم..). ﴿ومن يفعل ذلك ابتغاء مرضاة الله﴾ جا هەرکەس بەمەبەستی ڕەزاو خۆشنوودی خوا بەنهێنی کار بکا، بۆ هەرکارێکی پەسەند ﴿فسوف نؤتيه اجرا عظيما﴾ لەدواییدا پاداشێکی گەورەو بێ سنووری ئەدەنێ ﴿[١١٥] ومن يشاقق الرسول من بعد ماتبين له الهدى﴾ هەرکەسێك پاش ئەوەی ڕێگەی هەق و ڕاستیی بۆدەرکەوت و شارەزای دینی خوابوو (وەکو ئوبەیریق)، دژایەتی پێغەمبەر ﷺ بکا ﴿ويتبع غير سبيل المؤمنين﴾ و ڕێگا و ڕێبازێ بگرێتە بەر، کە ڕێگای ڕاستی باوەڕداران نەبێت ﴿نوله ما تولى ونصله جهنم﴾ ئێمەیش ڕووی ئەکەینە ئەو بەرنامەو ڕێگایە بەئارەزوی خۆی لەدنیادا هەڵیبژاردووە، ئیتر ئێمە وازی لێدێنین و، هەقمان نییە بەسەریەوە و، لەقیامەتیشدا ئەیخەینە ناو ئاگری تاودراوی دۆزەخەوە ﴿وساءت مصيرا﴾ ئای کە دۆزەخ جێ و ڕێیەکی زۆر سامناك وخراپە و، بۆیان ئامادەکراوە.

ڕێنماییەکانی ئایەتی (١١٤-١١٥):

١- چپەو سرتە سرتی دووکەس، بێ ڕەزامەندی سێیەمیان حەرامە.

٢- هەموو کۆبوونەوەیەکی نهێنی خێری تیدا نییە، ئەگەر بۆ کۆکردنەوەی خێرو سەدەقە، یان بۆ فەرمان بەچاکە، یان بۆ ڕێکخستنی نێوان دووکەسی ناکۆك نەبێ.

٣- دەرچوون لەنەخشەو پلانی ئەهلی سوونەت و جەماعەت، و پەیڕەوی کردن لەدەست و تاقمە سەرلێشێواوەکان کارێکی قەدەغەو حەرامە.

**خوا لە موشریکان نابووری:**

﴿[١١٦] إن الله لايغفر ان يشرك به﴾ بێگومان خوا لەوانە خۆش نابێ هاوەڵ و هاوەبەشی بۆدانێن ﴿ويغفر ما دون ذلك لمن يشاء﴾ تاوانی کەمتر لەشیرك بۆ هەرکەسێك خۆی بیەوێ وشایستە بێت ئەبورێ ﴿ومن يشرك بالله فقد ضل ضلالا بعيدا﴾ دەسا بزانن کە هەرکەسێك شەریك و هاوبەش دابنێت بۆخوا، بەڕاستیی لەڕادەبەدەر گومڕاو سەرلێشێواوە ﴿[١١٧] إن يدعون من دونه إلا إناثا﴾ ئەوانە لەجیاتی خوا هاناو پەنا دەبەنە بەر دوبتی وا کەزۆربەیان بۆخۆیان ناوی مێینەیان لێناون، وەکو: (لات، عوزا، مەنات) ﴿و إن يدعون إلا شيطانا مريدا﴾ دیارە هەرهانا دەبەنە بەر شەیتانێکی دەرکراوو گومڕاو لەسنووردەرچوو، چونکە ئەوە هەڵیان دەنێت بۆئەوجۆرە کردارانە! مەبەست بەم ئایەتە پەرستن و گوێرایەڵی لەشەیتانە، وەك لەسوورەتی (یس: ٦٠): (ألم أعهد إليكم يا بنى آدم الا تعبدوا الشيطان) یان لەسوورەتی (مریم: ٤٤): (.. لاتعبد الشيطان ..) هاتووە . ﴿[١١٨] لعنه الله﴾ خوای گەورە لە ڕەحمەت و میهرەبانی خۆی ئەو شەیتانەی بێبەشکرد ﴿وقال لأتخذن من عبادك نصيبا مفروضا﴾ ئەویش بەملهوڕی خۆی گوتی بەخوا: شەرت بێت لەبەندەکانی تۆ بەشێك دابڕم بۆخۆم، هەروەك لەسوورەتی (الإسراء: ٦٢)دا: (ارأيتك هذا الذى كرمت علي لئن أخرتنى إلى يوم القيامة لأحتنكن ذريته..) بۆچۆنیەتی وشێوەی سەرلێشێواو کردنیان هاتووە. وە لەسوورەتی (السبأ: ٢٠)دا: (ولقد صدق عليهم إبليس ظنه) هاتووە کە: چۆن شەیتان بۆچوون و گومانەکەی خۆی بردەسەرو خەڵکێکی زۆر وەدووی قسەی کەوتن، هەروەها لەسوورەتی (الحجر: ٣٩-٤٠): (ولأغوينهم أجمعين * إلا عبادك منهم المخلصين) وە لەسوورەتی (النحل: ١٠٠): (إنما سلطانه على الذين يتولونه والذين هم به

مشركون) هاتووه كه: شەيتان هەرگیز دەسەلاتی بەسەر موسڵمانە راست و دڵسۆزەكاندا نابێ. ﴿١١٩ ولأضلنهم ولأمنينهم﴾ هەروەها وتوویەتی هەر دەبێت لەراستەڕێ سەرلێشێواوییان بكەمو دڵیان پڕكەم لەئاوات و ئارەزووی ناراست و سەرقاڵیان كەم، بۆیە بەوخەڵكەی دەگوت: زیندووبوونەوەو هیچ حیساب و كیتابێ نییە، وە هەروەها ﴿ولآمرنهم فليبتكن آذان الأنعام﴾ مەرج بێ بۆخۆم فەرمانیان پێبدەم، گوێی ئاژاڵ و مەڕوماڵاتیان دابڕن، یا بیبڕن و بیكەنە نیشانەی حەرام بوونیان، بەڵێ لەسەردەمی نەفامیدا هەر وشترێك پێنج سكی كردبا، دیارییان ئەكرد بۆ بتەكانیان و گۆشتیان نەئەخوارد ﴿و لآمرنهم فليغيرن خلق الله﴾ وە دەبێ فەرمانیشیان پێبدەم كە: شكڵ و بیچمی دروستكراوەكانی خوا تێك بدەن و بگۆڕن (ئیبنی عەبباس و، موجاهیدو، زەحاك) دەڵێن: مەبەست لەم گۆڕین و دەسكاری كردنی خەڵكی خوایە، تێكدان و گۆڕینی دینی خوایە لێیان، (تەبەریی)ش هەر ئەمەی پێ باشە. منیش هەروا ئەزانم كە مەبەست بەو گۆڕینە، گۆڕینی دین و (فیترەت)یانە، ئەگەرچی هەندێ ماناو مەبەستی تریش بگەیەنێت. وەك هەندێ لەراڤەكەرانی قورئان لەم شوێنەدا ئاماژە بەهەندێ شتی تر ئەكەن، وەك كوتانی خاڵ و، رێكوپێككردن و هەڵگرتنی برۆو، شاش كردنی ددان و، هەڵكێشانی مووی روخسارو رووومەت، بۆ پشتگیری قسەكەیان ئەم فەرموودەیەش دەهێنن: ((لَعَنَ اللهُ الواشِمات والمُسْتَوْشِمات، والنامِصات والمُتَنَمِّصات، وَ المُتَفَلِّجاتِ لِلْحُسنِ المُغيِّرات خَلْقَ الله)). بوخاریی/ كتاب اللباس/ ٥٩٣١. موسلیم / كتاب اللباس والزينة /١٦٧٨ واتە: نەعلەتی خوا لەو ژنانە كە: خاڵ دەكوتن بۆ ژنانی تر، لەو ژنانەش خاڵیان بۆ دەكوتن، لەو ژنانەش روخسار هەڵدەگرن و، لەوانەش رووویان بۆ هەڵدەگرن، لەو ژنانەش ددانەكانیان باریك و شاش دەكەن و بەوە خۆیان لەخەڵك دەگۆڕن. لەسورەتی (الروم: ٣٠): (فأقم وجهك للدين حنيفا فطرت الله التي فطر الناس عليها لاتبديل لخلق الله) بەراشكاوی پشتگیری ئەو راستییە ئەكات كەدەڵێ: ئەو گۆڕینە شێواندنو گورینی دین و فیترەتە ﴿ومن يتخذ الشيطان وليا من دون الله﴾ جا هەركەسێ لەباتی خوا شەیتان بكاتە دۆست و یارمەتیدەر بۆخۆی و واز لەئایینی خوا بێنێ ﴿فقد خسر خسرانا مبينا﴾ بەراستیی زەرەرو زیانێكی ئاشكرای كردووە، چونكە قیامەتی لەكیس دەدا ﴿١٢٠ يعدهم و يمنيهم﴾ شەیتان هەمیشە بەڵێنی سەركەوتن و بەختیارییان پێدەداو، بەئاوات و ئارەزوو دڵخۆشیان ئەكا ﴿وما يعدهم الشيطان إلا غرورا﴾ خۆ لەراستیشدا بەڵێنی شەیتان هەردرۆو فریودان و چەواشەكردنە ﴿١٢١ اولئك مأواهم جهنم﴾ جێ و رێی ئەمانە دۆزەخە ﴿ولا يجدون عنها محيصا﴾ بێ لەو پەناگەیەكی تریان دەست ناكەوێ و، هەرگیز ڕزگاریان نابێت لێی.

رێنماییەكانی ئایەتی (١١٦-١٢١):

١- تەواوی گوناحان بەبچوك و گەورەیەوە بێجگە لەشیرك، خوای میهرەبان دەیانبوورێ ئەگەر خۆی حەزكا، (عەلی كوڕی ئەبی تالیب) ئەڵێ: لەقورئاندا ئایەتی تر نییە وەك ئەم ئایەتەی: (إن الله لايغفر أن يشرك به، ويغفر ما دون ذلك لمن يشاء) لام خۆشەویستربێ/ ئیمامی (تیرمیزیی) هێناویەتی.

٢- بتپەرستان و ئارەزوو هەوا پەرستان، لەبنەڕەتدا گشت شەیتان پەرستن.

٣- بەڵگەی شەیتان پەرستیی ئەنجامدانی گوناحەكانە بەبچوك و گەورەیانەوە.

٤- خاڵ كوتان و برۆ و روخسار هەڵگرتن و، ددان شاش و باریك كردن و، داخكردنی حەیوان و، خەساندنی ئاژەڵ و ئادەمزاد كارێكی یاساغ و حەرامە. چەكی شەیتان هەمیشە درۆو دەلەسەو ئارەزوو بازیی و لەخشتەبردنی (جن) و مرۆڤە ﴿١٢٢ والذين آمنوا وعملوا الصالحات﴾ ئەوانە كە باوەڕیان هەیەو ئاكاری چاك ئەنجام دەدەنو بە

گوێی شەیتان ناکەن ﴿سندخلهم جنات تجری من تحتها الأنهار﴾ بێگومان ئەیانبەینە ناو چەند باخ و باخاتێکی بەهەشتەوە کە جۆگەی ئاوو ڕووبار بەبەریاندا دەڕوا ﴿خالدین فیها أبدا﴾ هەتا سەریش هەرلەوێ ئەبن ﴿وعدالله حقا﴾ دیارە ئەو بەڵێنەی خوا پێیداون هەقەو جێبەجێی دەکا ﴿ومن أصدق من الله قیلا﴾ جا چ کەسێك لەخوا ڕاست بێژترە لەبڕیارەکانیدا؟.

### مرۆڤ بەئاوات بە ئامانج ناگات:

﴿[١٢٣] لیس بأمانیکم ولا أمانی أهل الکتاب﴾ پاداش و بەرزونزمکردن و بەڵێنەکانی خوا نە بەئاوات وئارەزووی ئێوەیە ئەی موسڵمانان! وەنە بەئاوات و ئارەزووی خاوەن نامەکانیشە بەڵکو بەهەوڵ و تێکۆشان وگوێرایەڵی کردنی خوایە. ئیبنی عەباس ئەڵێت: خوای گەورە بەم ئایەتە تەماحی خستنەبەر بۆهەوڵ وتێکۆشان لەدنیاو قیامەت ﴿من یعمل سوءا یجز به﴾ هەرکەسێك هەرکارێکی ناڕەواو خراپ بکا، دڵنیا بن هەر بەوکارەی خۆیە جەزرەبە دەدرێ ﴿ولا یجد له من دون الله ولیا ولا نصیرا﴾ بێجگە لەخوا هیچ چاودێرو یارمەتیدەرێکی دەست ناکەوێ بەهاواریەوە بێت ﴿[١٢٤] ومن یعمل من الصالحات من ذکر أو أنثی وهو مؤمن﴾ هەرکەسێك نێر بێ، یان مێ هەرئەوەندە کە خاوەن باوەر بێت و ئاکارچاك بێت ﴿فأولئك یدخلون الجنة ولا یظلمون نقیرا﴾ دەچنە بەهەشتەوەو کەمترین ستەمیشیان لێناکرێ، ئەگەرچی بەئەندازەی خاڵی وردیلەی ناوکە خورمایەکیش بێت (النقیر: النكتة في ظهر النواة) ﴿[١٢٥] ومن أحسن دینا ممن أسلم وجهه لله وهو محسن﴾ ئاخۆ دیندارێك هەبێ ئایینی لەوکەسە باشترو چاکتر بێ کەخۆی دابێتە دەستی خواو ئاکارچاکیش بێ ﴿واتبع ملة إبراهیم حنیفا﴾ و کەوتبێتە شوێنی ئایینی پاکی ئیبراهیمێ کە لەهەمووشتێ لایدابێ و، هەرتەنها بەرەوخوا هاتبێ؟ ﴿واتخذ الله إبراهیم خلیلا﴾ لەکاتێکدا خوا ئەو ئیبراهیمەی کردۆتە دۆست و خۆشەویستی خۆی، دەسا ئێوە پەیرەویی لێبکەن ﴿[١٢٦] ولله مافی السموات وما فی الأرض﴾ شیاوی باسیشە خوا هەرچی ئەکات لەبەر پێویستی خۆی نییە، چونکە هەرشتێك لەئاسمانەکان و، لەزەوییدایە هی خوایە ﴿وکان الله بکل شئ محیطا﴾ هەرئەویشە کە بەهەمووشتێك بەئاگاو زانایە، هیچی لا ون نابێت.

الجزء الخامس | سورة النساء

وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَنُدْخِلُهُمْ
جَنَّٰتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًاۖ وَعْدَ
ٱللَّهِ حَقًّاۚ وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ ٱللَّهِ قِيلًا ﴿١٢٢﴾ لَّيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ
وَلَآ أَمَانِيِّ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِۗ مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ
وَلَا يَجِدْ لَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿١٢٣﴾ وَمَن
يَعْمَلْ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ
فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ وَلَا يُظْلَمُونَ نَقِيرًا ﴿١٢٤﴾ وَمَنْ
أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ وَٱتَّبَعَ
مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًاۗ وَٱتَّخَذَ ٱللَّهُ إِبْرَٰهِيمَ خَلِيلًا ﴿١٢٥﴾ وَلِلَّهِ مَا
فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ
مُّحِيطًا ﴿١٢٦﴾ وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي ٱلنِّسَآءِۖ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ
فِيهِنَّ وَمَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فِي ٱلْكِتَٰبِ فِي يَتَٰمَى ٱلنِّسَآءِ
ٱلَّٰتِي لَا تُؤْتُونَهُنَّ مَا كُتِبَ لَهُنَّ وَتَرْغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ
وَٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلْوِلْدَٰنِ وَأَن تَقُومُواْ لِلْيَتَٰمَىٰ
بِٱلْقِسْطِۚ وَمَا تَفْعَلُواْ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِهِۦ عَلِيمًا ﴿١٢٧﴾

وَإِنِ ٱمْرَأَةٌ | ٩٨

### ماڵی کیژە هەتیوەکان مەخۆن:

﴿[١٢٧] ویستفتونك فی النساء﴾ هاوەڵانت ئەی پێغەمبەر ﷺ! لەبارەی ژنانەوە هەتیوبن یان هەتیو نەبن لێت ئەپرسن کە: دەبێ چ مافێکیان لەسەر بێت بۆیان؟ ﴿قل الله یفتیکم فیهن وما یتلی علیکم فی الکتاب﴾ تۆش پێیان بڵێ: خوا خۆی لەم کتێبەدا کە بۆتان دەخوێنرێتەوە فەتواو وەڵامتان ئەداتەوەو بۆتان ڕوون ئەکاتەوە ﴿فی یتامی

النساء اللاتي لا تؤتونهن ما كتب لهن ﴾ سەبارەت بە میراتی ئەو كیژۆڵە هەتیوانە لاتانن و دەتانەوێ لەو مارەیی و میراتە خوا بۆی نووسیون بیبەشیان كەن، بەڵێ لەم جێیەدا ڕوون نەكراوەتەوە كە ئەوەی لەم قورئانەدا دەخوێنرێتەوەو دیاری دەكرێ بۆژنان چییە؟ بەڵام هەرلەسەرەتای ئەم سوورەتە خۆیەوە بە ئایەتی: (وإن خفتم ألا تقسطوا في اليتامى فانكحوا ما طاب لكم من النساء) ڕوون كراوەتەوە كە مەبەست خواردنی مافی ئەوكچە هەتیوانەیە كە لەژێر ركێفی ئەواندان و، هەتا خەڵكیش لە مارەكردنی ئەو كچە هەتیوانەدا بترسن و سڵ بكەنەوە و، بچن ژنانی تر مارەبكەن ﴿وترغبون ان تنكحوهن﴾ دەتانەوێ لەخۆتانیان مارەبكەن و مارەییشیان نەدەنێ! دیارە خوا ڕێتان لێدەگرێ مارەییان بخۆن و میراتیان نەدەنێ ﴿والمستضعفين من الولدان﴾ هەروەها فەرمانتان پێدەدات لەبابەت كوڕانی مێرمندالّ و خەڵكانی لاوازەوە كە: بەرێكوپێكی میراتیان بدەنێ و ستەمیان لێنەكەن، ﴿وان تقوموا لليتامى بالقسط﴾ دەبێ لەگەڵ گشت هەتیوانیشدا بەعەدالەت و جوامێرانە ڕەفتار بكەن و بجولێنەوە، بەڵێ لەم جێگایەدا شێوەی دادگەریی لەگەڵ مندالاّندا ڕوون نەكراوەتەوە، بەڵام لەسورەتی (الأنعام: ١٢٥) دا دەفەرموێ: (ولاتقربوا مال اليتيم إلا بالتي هي أحسن) وە لەسورەتی (البقره: ٢٢٠): (قل إصلاح لهم خير وإن تخالطوهم فإخوانكم والله يعلم المفسد من المصلح) وە لەسورەتی (الضحى: ٩)دا (فأما اليتيم فلا تقهر) وە لەسورەتی (البقره: ١٧٧): (وآتى المال على حبه ذوي القربى واليتامى) شێوەی ڕەفتاری دادگەرانە لەگەڵ هەتیواندا هاتووەو ڕوونكراوەتەوە. ﴿وما تفعلوا من خير فإن الله كان به عليما﴾ و هەركارێكی خێروچاكە بكەن وەك دادگەریی لەگەڵ ژنان و هەتیواندا، دڵنیابن خوا پێی ئاگاو زانایە. (ئیبنی عەباس) ئەڵێت: ئەم ئایەتە لەبارەی ئەوكەسانەوە هاتەخوارێ كەكیژۆڵەی هەتیویان لابوو بەخێویان دەكرد، بەڵام وەك عادەت و باوی نالەباری خۆیان شتێكیان فرێدەدایە سەری، بەوە دەبوونە ماڵیان! ئینجا ئەگەر جوان وشۆخ و شەنگ بووبا نەیان ئەهێشت كەس بیخوازێ و داوای بكات، كاتێكیش مردبا گشت سامانەكەیان دەخوارد. ئەوجا خوا فەرمووی: (و يستفتونك ..) هەروەها دەڵێت: سەردەمی پێش ئیسلام كیژۆڵەو كوڕانی مێر مندالّ میراتیان نەئەدانێ، جا خوا فەرمووی: (.. وأن تقوموا لليتامى بالقسط) پێشەوا بوخاریی ئەم ڕیوایەتەی هێناوە.

الجزء الخامس — سورة النساء

وَإِنِ امْرَأَةٌ خَافَتْ مِن بَعْلِهَا نُشُوزًا أَوْ إِعْرَاضًا فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا أَن يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًا وَالصُّلْحُ خَيْرٌ وَأُحْضِرَتِ الْأَنفُسُ الشُّحَّ وَإِن تُحْسِنُوا وَتَتَّقُوا فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴿١٢٨﴾ وَلَن تَسْتَطِيعُوا أَن تَعْدِلُوا بَيْنَ النِّسَاءِ وَلَوْ حَرَصْتُمْ فَلَا تَمِيلُوا كُلَّ الْمَيْلِ فَتَذَرُوهَا كَالْمُعَلَّقَةِ وَإِن تُصْلِحُوا وَتَتَّقُوا فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٢٩﴾ وَإِن يَتَفَرَّقَا يُغْنِ اللَّهُ كُلًّا مِّن سَعَتِهِ وَكَانَ اللَّهُ وَاسِعًا حَكِيمًا ﴿١٣٠﴾ وَلِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَلَقَدْ وَصَّيْنَا الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِن قَبْلِكُمْ وَإِيَّاكُمْ أَنِ اتَّقُوا اللَّهَ وَإِن تَكْفُرُوا فَإِنَّ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَكَانَ اللَّهُ غَنِيًّا حَمِيدًا ﴿١٣١﴾ وَلِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَكَفَىٰ بِاللَّهِ وَكِيلًا ﴿١٣٢﴾ إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ أَيُّهَا النَّاسُ وَيَأْتِ بِآخَرِينَ وَكَانَ اللَّهُ عَلَىٰ ذَٰلِكَ قَدِيرًا ﴿١٣٣﴾ مَّن كَانَ يُرِيدُ ثَوَابَ الدُّنْيَا فَعِندَ اللَّهِ ثَوَابُ الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَكَانَ اللَّهُ سَمِيعًا بَصِيرًا ﴿١٣٤﴾

٩٩

**قوشقی بوونی پیاو لەهاوسەرەكەی:**

﴿[128] وإن امراة خافت من بعلها نشوزا او إعراضا﴾ ئەگەر ژنێك هەستی كرد مێردەكەی لاسارەو قوشقیی بووە، ﴿فلا جناح عليهما ان يصلحا بينهما صلحا﴾ هیچ گوناهێ نییە ئەوژن و پیاوە هەوڵی ئاشتیی و پێكهاتن بدەن و چاوپۆشی لەهەندێ مافی یەكتر بكەن ﴿والصلح خير﴾ دیارە ئاشتیی و ڕێكەوتن لەو دڕدۆنگیی و لاساریی، و

ناچیزەیی پیاو و تەڵاق و جیابوونەوەیە چاکترو باشترە ﴿واحضرت الأنفس الشح﴾ خۆ ڕژدیی و بەخیلی و سوورببوون لەسەر ماڵی دنیاش لە نەفس و دەروونی هەموو مرۆڤێکا هەیە بۆیە لەوانەیە ژنەکە دەست لەمارەییەکەی خۆی هەڵنەگریٙ و، پیاوەکەش نەگۆڕدریٙ ئاژاوەکە هەر بمێنێتەوە ﴿وإن تحسنوا وتتقوا﴾ جا ئەگەر لەگەڵ خێزانەکانتاندا چاکە بکەن، هەرچەندە ئەوانیش هەر خراپ بن و خۆ لە لاساریی و ناچیزەیی بپارێزن ﴿فإن الله كان بما تعملون خبيرا﴾ بێگومان خوا بەهەموو کاروکردەوەیەکتان ئاگایە. پەیامبەری خوا ﷺ بەرنامەی دانابوو بۆکاتی مانەوە لای خێزانەکانیو کاتەکانی بۆدابەشکرد بوون، لەگەڵ ئەوەشدا هەرئەیفەرموو: ((اللهم هذا قسمي فيما أملك، فلا تؤاخذني فيما تملك ولا أملك)) مەبەستی ئەوەبوو کە خوایە! خۆت چاک دەزانی کەمن لەو کارانەدا دەسەڵاتم هەیە بەسەریاندا ژنەکانم لەیەکتر جیا ناکەمەوەو، هەریەکەیان مافی خۆی دەدەمێ، بەڵام ئەگەر یەکێکیان خۆشەویستیی لەدڵمدا پتر بوو، سا تۆ لێم مەگرە. خاتوو عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، ئەڵێت: ئەگەر پیاوێك دوو ژنی هەبووباو، یەکێکیانی حەز لێ نەکردبا، وەیان بەکەڵکی ژن و مێردی نەهاتباو بیویستایە تەڵاقی بدا، ژنەکە دەیوت تەڵاقم مەدەو، سەبارەت بەکاروباری منیش ئازاد بە، جائیتر ئەم ئایەتە: (فلا جناح عليهما..) هات، بوخاریی و موسلیم هێناویانە، ئەگەرچی هەندێ جیاوازیشیان هەبێ.

**هەر چەن بکۆشن ناتوانن لەگەڵ ژنانتاندا (بێ جیاوازی) ڕەفتار بکەن:**

﴿[129] ولن تستطيعوا أن تعدلوا بين النساء ولو حرصتم﴾ دڵنیاشبن هەرگیز ناتوانن هەرچەند هەوڵیش بدەن کە بە یەکسانی و بێ جیاوازی لەگەڵ ژنانی خۆتاندا ڕەفتار بکەن. زانایان دەڵێن: مەبەست بەم (عەدالەت)ـە لەم ئایەتەدا کە جێبەجێ نابێ لەنێوان ژن و مێردا تەنها خۆشەویستی دڵ و دەروونیە، چونکە دەگونجێ پیاو یەکێ لەهاوسەرەکانی لا خۆشەویستتر بێ لەدڵدا، دیارە ئەوەیش هیچ گوناهێکی تێدا نییە بەومەرجە کاری پێنەکا ﴿فلا تميلوا كل الميل فتذروها كالمعلقة﴾ جاکەوابوو ئەوەندە دووریان مەخەنەوە لەخۆتان، هەتا بیانکەنە هەڵپەساردەو داماو بن، واتە: نە تەڵاق درابێت تا بچێت بۆخۆی شوو بکات، نەوەك مێرداریش بێت مافی خۆی وەرگرێت ﴿وإن تصلحوا وتتقوا فإن الله كان غفورا رحيما﴾ ئەگەر لەگەڵیان پێك بێنو لەگوناح خۆ بپارێزن و لەخوار بوونەوە لەبڕیارەکانی خوا بەرامبەریان پارێز بکەن، ئەوا بەڕاستی خوا لێبوردەو بەڕەحمەو میهرەبانە ﴿[130] وإن يتفرقا يغن الله كلا من سعته﴾ خۆئەگەر پاش هەوڵێکی زۆر بۆ پێکهێنانیان هەر بەیەکجاری دەس لێك بەردەن، خوای گەورە هەردوولایان بێ نیاز ئەکاو لەدەستگوشادی خۆی دەروویان لێدەکاتەوە، واتە: یەکی کەسیان لەسەر ئەوی دیکەیان ناخاو لەوانەشە هاوسەرێکی باشتر بەمێردەکە بداو، مێردێکی چاکتریش بەژنەکە بدا ﴿وكان الله واسعا حكيما﴾ چونکە خوا هەر بۆخۆی دەست گوشادو کارزانو کارجوانە ﴿[131] ولله مافى السموات وما فى الأرض﴾ بێگومان هەرچی لەئاسمانەکان و زەوییدایە هەربۆخۆیەو هەرئەویش خاوەنیەتی ﴿ولقد وصينا الذين اوتوا الكتاب من قبلكم وإياكم﴾ بەڕاستی ئێمەو ئێوەو ئەو کەسانەش لەپێش ئێوەدا کتێبمان دانێ ڕامان سپاردن ﴿أن اتقوا الله﴾ کەدەبێ هەر لەخوا بترسن و بەباشی فەرمانەکانی جێبەجێ بکەن ﴿وإن تكفروا فإن لله مافى السموات وما فى الأرض﴾ خۆئەگەر بێ باوەڕیش بن، و حاشای لێبکەن، چاك بزانن کە هەرچی لەئاسمانەکانو زەوییدایە هەر هی خوایە، ﴿وكان الله غنيا حميدا﴾ و بۆخۆشی لەگشت کەس بێ نیازو دەوڵەمەندی سوپاس کراوە ﴿[132] ولله ماق السموات وما ق الأرض﴾ بەڵێ هەرچی لەئاسمانەکان و لەزەوییدایە هەر بۆخوایە، دەسا کەی پێویستی بەئێوەیە؟ ﴿و كفى بالله وكيلا﴾ هەرخواش بەسە بریکار بێ ﴿[133] إن يشأ يذهبكم أيها الناس ويأت بآخرين﴾ ئەی خەڵکینە!

ئەگەر خوا بیەوێ گشتتان تەفروتوونا دەكاو، لە جێگەی ئێوەدا خەڵكێكی تر دێنێ، ئەم ڕاستیییە چەند جارێ لەقورئانی پیرۆزدا دووپاتكراوەتەوە، وەك لەسوورەتی (الأنعام: ١٣٣): (إن يشأ يذهبكم و يستخلف من بعدكم مايشاء كما انشأكم من ذرية قوم آخرين) وە لەسوورەتی (محمد: ٣٨)دا: (و إن تتولوا يستبدل قوما غيركم ثم لايكونوا امثالكم) وە لەسوورەتی (إبراهيم: ١٩-٢١)دا: (إن يشأ يذهبكم ويأت بخلق جديد وما ذلك على الله بعزيز).

﴿و كان الله على ذلك قديرا﴾ و خوا هەمیشە لەسەر كاری وا بەتوانایە ﴿[١٣٤] من كان يرد ثواب الدنيا فعند الله ثواب الدنيا والآخرة﴾ هەركەسێك خۆشی و پاداشتی ئەم دونیایەی بوێ، باچاك بزانێ كەخۆشی و پاداشتی دونیاو دواڕۆژیش هەرلای خوایە، ئیتر بۆچی ئەوكەسە هەرتەنها دونیای دەوێت؟! ﴿وكان الله سميعا بصيرا﴾ خواش بەردەوام ژنەوای بینایە ئاگاداری كاروكردارتانە و، هەر بەپێی ئەوەیش پاداش و تۆڵە ئەداتەوە.

الجزء الخامس | سورة النساء

۞ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوَّامِينَ بِالْقِسْطِ شُهَدَاءَ لِلَّهِ
وَلَوْ عَلَىٰ أَنفُسِكُمْ أَوِ الْوَالِدَيْنِ وَالْأَقْرَبِينَ ۚ إِن يَكُنْ غَنِيًّا
أَوْ فَقِيرًا فَاللَّهُ أَوْلَىٰ بِهِمَا ۖ فَلَا تَتَّبِعُوا الْهَوَىٰ أَن تَعْدِلُوا ۚ وَإِن
تَلْوُوا أَوْ تُعْرِضُوا فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴿١٣٥﴾ يَا أَيُّهَا
الَّذِينَ آمَنُوا آمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَالْكِتَابِ الَّذِي نَزَّلَ
عَلَىٰ رَسُولِهِ وَالْكِتَابِ الَّذِي أَنزَلَ مِن قَبْلُ ۚ وَمَن يَكْفُرْ
بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَقَدْ ضَلَّ
ضَلَالًا بَعِيدًا ﴿١٣٦﴾ إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا ثُمَّ كَفَرُوا ثُمَّ آمَنُوا
ثُمَّ كَفَرُوا ثُمَّ ازْدَادُوا كُفْرًا لَّمْ يَكُنِ اللَّهُ لِيَغْفِرَ لَهُمْ وَلَا لِيَهْدِيَهُمْ
سَبِيلًا ﴿١٣٧﴾ بَشِّرِ الْمُنَافِقِينَ بِأَنَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٣٨﴾ الَّذِينَ
يَتَّخِذُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاءَ مِن دُونِ الْمُؤْمِنِينَ ۚ أَيَبْتَغُونَ
عِندَهُمُ الْعِزَّةَ فَإِنَّ الْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا ﴿١٣٩﴾ وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِي
الْكِتَابِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ آيَاتِ اللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلَا
تَقْعُدُوا مَعَهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ ۚ إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ ۗ
إِنَّ اللَّهَ جَامِعُ الْمُنَافِقِينَ وَالْكَافِرِينَ فِي جَهَنَّمَ جَمِيعًا ﴿١٤٠﴾

١٠٠ | الَّذِينَ يَتَرَبَّصُونَ

### بێ جیاوازی كاری مەردم را پەڕێنن:

﴿[١٣٥] یاایهاالذین آمنوا كونوا قوامین بالقسط﴾ ئەی ئەوكەسانەی باوەڕتان هەیە! بەدادپەروەری و یەكسانی هەڵسن بۆ ئەنجامدانی كاری مەردم، بەشێوەیەك هیچ كات ستەمتان لێنەوەشێتەوە ﴿شهداء لله﴾ هەمیشەش شایەدی لەسەر هەق بدەن بۆخوا، ﴿و لو على انفسكم اوالوالدين و الأقربين﴾ ئەگەرچی ئەوشایەتییەش بەزیانی خۆتان و، دایك و باوك و خزمانیشتان بێت، دەبێ ئێوە هەر بەڕێكی جێبەجێی بكەن بێ لادان ﴿إن يكن غنيا او فقيرا فالله اولى بهما﴾ ئەگەر شایەتی بۆ دراو دەوڵەمەند بێ یان هەژار، دڵنیابن خوا باشترە بۆیان لەئێوە، چونكە ئەوخۆی چاك ئەزانێ بەرژەوەندییان لەچیدایە ﴿فلا تتبعوا الهوى ان تعدلوا﴾ كەوابوو مەكەونە شوێنی هەواو ئارەزووتان تا لەهەق لابدەن، واتە: خزمایەتی تینتان تێنەكات بۆ شاردنەوەی شایەدییەكە بەهەق ﴿وإن تلووا او تعرضوا﴾ خۆئەگەر زمان بپێچن بەیەكاو لەهەق مل بابدەن، یان خۆتانی لێ لابدەن و هەقەكە بگۆڕن ﴿فإن الله كان بما تعملون خبيرا﴾ بێگومان خۆتان چاك ئەزانن كەخوا بەوكارە دەیكەن هەمیشە ئاگایە. كەواتە وریابن كەتمانی هەق مەكەن، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: شایەتی باش و پەسەند ئەوەیە بەرلەوە داوای لێبكرێ شایەتی بدات، ئەو شایەتە خۆی دەبێت لەبەرخوا شایەتی بدات. (موسلیم) گێڕاویەتیەوە. دەسا تۆش نەلەبەر دەوڵەمەندی كەسێك و، نە لەبەر هەژاری كەسێكی دیكە شایەتییەكە مەشێوێنە.

### ئەی ئیمانداران! ئیمانتان كامڵ كەن:

﴿[١٣٦] يا أيها الذين آمَنوا آمِنوا بالله ورسوله والكتاب الذى نزّل على رسوله والكتاب الذى انزل من قبل﴾ ئەی گەلی خاوەن باوەڕ! دەبێ باشتر و باشتر باوەر بێنن بەخواو بەپێغەمبەرەكەی و بەوكتێبەیش بەش بەش ناردی بۆ

پێغەمبەری خۆی موحەممەد ﷺ و بەوكتێبانەیش بەرلەقورئان ناردنی، وەكو تەورات و ئینجیل و پەڕاوەكانی تر، هەتا ئیمانتان كامڵتر ببێ و، هەمووشتان هەست بەبرایەتی و تەبایی بكەن لەژێر سایەی دینی خوادا ﴿ومن يكفر بالله وملائكته وكتبه ورسله واليوم الآخر﴾ هەركەسێكیش باوەڕی نەبێ بەخواو بەفریشتەكانی و، بەكتێبەكانی و بەپەیامبەرەكانی و، بەرۆژی دوایی ﴿فقد ضل ضلالا بعيدا﴾ ئەوە لەرادە بەدەر لەرێگەی هەقەوە دوورەو چاوەڕوانی هیدایەتی لێناكرێ.

**دووڕووەكان حولحولی مەزەبن:**

﴿[١٣٧] إن الذين آمنوا ثم كفروا ثم آمنوا ثم كفروا ثم از دادوا كفرا﴾ بەڕاستیی ئەو دووڕووانەش كە یەكەمجار باوەڕیان هێناو پاشان پەشیمان بوونەوەو، دووبارە بڕوایان هێنایەوەو، هەر بەشوێنیا كافر بوونەوە. ئەوسا بێ باوەڕی خۆیان زیاتر كرد هەتا مردن هەركافر بوون ﴿لم يكن الله ليغفرلهم﴾ هەرگیز لەڕیی ئەوەدا نییە خوا چاوپۆشییان لێبكا ﴿ولا ليهديهم سبيلا﴾ و بۆ رێگای راست و دروستیش شارەزایان بكا.

**رێنماییەكانی ئایەتی (١٣٥-١٣٧):**

١- دەبێ لەكاتی داوەریی و شایەتیداندا دادگەر بین.

٢- شایەتی ناهەق و، كیتمانی شایەتیی، كارێكی حەرامە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((الا انبئكم بأكبر الكبائر؟ قلنا بلى يارسول الله، قال: الشرك بالله، وعقوق الوالدين، وكان متكئا فجلس وقال: الا وشهادة الزور، الا وشهادة الزور، وما زال يكررها حتى قلنا ليته سكت)).

٣- مرۆڤ هەتا دەمرێت دەبێ هەر لەسەر بڕواو ئیمانی خۆی دامەزراو بێت.

٤- پایەكانی ئیمان و باوەڕ: باوەڕبوونە بەخواو بەفریشتەو بەكتێب و بەپێغەمبەران و بەرۆژەكەی تر، لەتەك قەزاو قەدەردا، وەكو دەفەرموێ: ((إنا كل شيء خلقناه بقدر)).

٥- لەدین وەرگەڕاو (مورتەد) بەلای هەندێ لەزانایانەوە سێ رۆژ مۆڵەتی پەشیمانی دەدرێتێ، جائەگەر لەوماوەیەدا پەشیمان نەبوویەوە دەكوژرێ، ئەوساش نە نوێژی لەسەر دەكرێ و، نەلە گۆڕستانی موسڵماناندا دەنێژرێت، هەندێ دەڵێن مۆڵەت نادرێ و یەكسەر دەكوژرێ ﴿[١٣٨] بشر المنافقين بأن لهم غذابا اليما﴾ ئەی پێغەمبەر ﷺ تۆ بەو دووڕووانە موژدە بدە كەسزایەكی ئێش پێگەیەنەریان هەیە، دیارە كەئەڵێت موژدەیان بدەرێ مەسخەرەیان پێدەكا، ئەگینە موژدە بەخۆشیی و رابواردن دەدرێ نەك بەسزا ﴿[١٣٩] الذين يتخذون الكافرين أولياء من دون المؤمنين﴾ دووڕووەكانیش ئەوكەسانەن دۆستی كافرو خوانەناسان دەكەن و، لەباوەڕداران دەتەكنەوەو، خۆشیان لەچارەیان نایەت و، كار بۆكافران دەكەن ﴿ايبتغون عندهم العزة﴾ ئاخۆ بەتەمان عیزەت و حورمەت و سەركەوتنیان لای ئەوانەوە دەسكەوێ؟! هەرئەم دەردەیە لەم سەردەمەی خۆشماندا كەبەشێكی زۆر لەموسڵمانان دەبینرێن شوێنی كۆمەڵانی تازە دروستكراو كەوتوون و خۆشیان دەوێن و چاوەڕوانی رێزو حورمەتیان لێوە دەكەن! ﴿فان العزة لله جميعا﴾ خۆبەراستیی هەرچی قەدرو رێزی دنیاو قیامەت هەیە، تەنها هەربەدەستی خوایەو هەرلای ئەویش دەست دەكەوێ، كەوابوو بۆچی پشتگیری لەم ولەو دەكەن، ئەی مەگەر خوا نافەرموێ: (من كان يريد العزة فلله العزة جميعا..) یان نافەرموێ: (ولله العزة ولرسوله و للمؤمنين ولكن المنافقين لايعلمون) ئیتر لەكوێ بەشوێنكەوتنی دوژمنانی دینی خوا سەركەوتوو دەبن؟! ﴿[١٤٠] وقد نزل عليكم فى الكتاب﴾ خۆ بەراستیی خوای گەورە لەم قورئانەدا بەئێوەی راگەیاندووە ﴿أن إذا سمعتم آيات الله يكفر بها ويستهزا بها﴾ كە هەركات زانیتان و

بیستان ئایەتەکانی خوا کەسانێك باوەڕیان پێناکەن و گاڵتەیان پێدەکەن ﴿فلا تقعدوا معهم حتى يخوضوا في حديث غيره﴾ هەتا ئەوباسە دەگۆڕن و دەچنە سەر قسەیەکی ترو واز لەوکارەیان دێنن، ئێوە لەگەڵیان دامەنیشن ﴿إنكم إذا مثلهم﴾ ئەگینا ئێوەش لە گوناح و تاواندا وەك ئەوان دەبن، وەك بەڕاشکاوی لەسورەتی (الأنعام: ٦٨): (وإذا رأيت الذين يخوضون في آياتنا فأعرض عنهم حتى يخوضوا في حديث غيره) بۆ پشتگیریی و دووپاتکردنەوەی ئەومەبەستە هاتووە، خۆئەگەر لەبیرتان چوو و لەگەڵیاندا دانیشتن، پاشان وەبیرتان هاتەوە، ئەبێ دەسبەجێ پشتیان لێ هەڵبکەن و لە کۆڕەکەیان هەڵسن. وەك لەسوورەتی (الأنعام: ٦٨)دا ئەفەرموێ: (وإما ينسينك الشيطان فلا تقعد بعد الذكرى مع القوم الظالمين). ﴿إن الله جامع المنافقين و الكافرين في جهنم جميعا﴾ دیارە خوای گەورەش لەرۆژی قیامەتدا گشت دووڕوو و بێ باوەڕەکان لە دۆزەخ کۆدەکاتەوە، هەروەك ئەوان لەدنیادا گشتیان قسەیان یەك بوو بۆ دوژمنایەتی موسڵمانان.

الجزء الخامس — سورة النساء

ٱلَّذِينَ يَتَرَبَّصُونَ بِكُمْ فَإِن كَانَ لَكُمْ فَتْحٌ مِّنَ ٱللَّهِ قَالُوٓاْ أَلَمْ
نَكُن مَّعَكُمْ وَإِن كَانَ لِلْكَٰفِرِينَ نَصِيبٌ قَالُوٓاْ أَلَمْ نَسْتَحْوِذْ
عَلَيْكُمْ وَنَمْنَعْكُم مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ فَٱللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ يَوْمَ
ٱلْقِيَٰمَةِ وَلَن يَجْعَلَ ٱللَّهُ لِلْكَٰفِرِينَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ سَبِيلًا ﴿١٤١﴾
إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَهُوَ خَٰدِعُهُمْ وَإِذَا قَامُوٓاْ إِلَى
ٱلصَّلَوٰةِ قَامُواْ كُسَالَىٰ يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ وَلَا يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ إِلَّا
قَلِيلًا ﴿١٤٢﴾ مُّذَبْذَبِينَ بَيْنَ ذَٰلِكَ لَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ وَلَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ
وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ سَبِيلًا ﴿١٤٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ
لَا تَتَّخِذُواْ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ أَتُرِيدُونَ
أَن تَجْعَلُواْ لِلَّهِ عَلَيْكُمْ سُلْطَٰنًا مُّبِينًا ﴿١٤٤﴾ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ
فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا ﴿١٤٥﴾
إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ وَأَصْلَحُواْ وَٱعْتَصَمُواْ بِٱللَّهِ وَأَخْلَصُواْ
دِينَهُمْ لِلَّهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَسَوْفَ يُؤْتِ ٱللَّهُ
ٱلْمُؤْمِنِينَ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١٤٦﴾ مَّا يَفْعَلُ ٱللَّهُ بِعَذَابِكُمْ
إِن شَكَرْتُمْ وَءَامَنتُمْ وَكَانَ ٱللَّهُ شَاكِرًا عَلِيمًا ﴿١٤٧﴾

١٠١

**دووڕووەکان بۆ رۆژێ دەگەڕێن:**

﴿[١٤١] الذين يتربصون بكم﴾ ئەو دووڕووانەی وا هەردەم چاوەڕوانی دەرفەتێك دەکەن لێتان و هەر لەمەڵاسدان بۆتان ﴿فإن كان لكم فتح من الله﴾ سا ئەگەر خوا ئێوەی سەرخست و زاڵبوون و دەستکەوتێکتان دەسکەوت ﴿قالوا ألم نكن معكم﴾ ئەڵێن: ئەی مەگەر ئێمەش لەگەڵ ئێوە نەبووین و پێکەوە جیهادمان نەکرد؟! ﴿وإن كان للكافرين نصيب﴾ خۆئەگەر بێ باوەڕانیش بەشێکیان دەستکەوت و سەرکەوتن بەرسەرتانا وەکو لەرۆژی ئوحودا ﴿قالوا ألم نستحوذ عليكم ونمنعكم من المؤمنين﴾ ئەڵێن: ئەی مەگەر ئێمە نەبووین نەمانهێشت باوەڕداران پێتان بگەن و زیانتان پێبگەیەنن؟ کەوابوو ئەبێ بەشی ئێمەشی لێبدەن ﴿فالله يحكم بينكم يوم القيامة﴾ خوا دوایی و رۆژی سەلا بڕیاری راست و دروستان بۆ دەدات، لەبەرئەوەی لەدنیادا بەتەواویی هەق و ناهەق لێك ناکرێتەوە ﴿ولن يجعل الله للكافرين على المؤمنين سبيلا﴾ دیارە کەخواش هەرگیز رێ نادا بێ باوەڕان دژی موسڵمانان بن و زاڵ بن بەسەریاندا، بەتایبەتی لەرۆژی قیامەتدا، وە لەم دنیایەشدا هەرگیز نابێ موسڵمانان ژێر دەستەی خوانەناس و بێ باوەڕان بن وحوکم و یاسای ئەوان جێبەجێ بکەن.

**رێنمایەکانی ئایەتی (١٣٨-١٤١):**

١- بەدۆستکردنی بێ باوەڕان و کافران و هاریکاریکردنیان کارێکی حەرامە، بۆنمونە: لەکاروباری ئاییندا پەنایان پێ ببرێ و بکرێنە کۆمەك، بۆ ئازاردانی تاقمێ لەموسڵمانان، چونکە ئەوکاتە کەموشریکێك چوویە لای پێغەمبەر ﷺ گوتی: من هاتووم یارمەتی تۆ بدەم لەجەنگدا، ئەویش لەوەڵامدا فەرمووی: ((إرجع فإنا لانستعين بمشرك)). واتە: بگەڕێوە، چونکە ئێمە رێمان پێنەدراوە موشریکان بکەینە هاوکارو لەجەنگەکاندا هاریکاریمان بکەن.

٢- عیزەت وحورمەت هەرگیز لای غەیری خوا بەدەست نایە.

٣- بەکۆی دەنگی زاناکانیش ڕەزامەندی بەرێبازی کوفر، هەر کوفرە.

**دەغەڵی دووڕووەکان:**

﴿١٤٢ إن المنافقين يخادعون الله وهو خادعهم﴾ بێگومان دووڕووە دەغەڵەکان بەخەیاڵی خاویان دەیانەوێ فێڵ لەخوا بکەن و بیخەڵەتێنن! ئەوپەڕە ملکەچی و بەرفەرمانەشیان هەر بۆئەوەیە، بەڵام خوا خەڵەتێنەرو تەفرەدەری ئەوانە، فڕوفێڵەکانیان زۆر بە ئاسانی پووچەڵ دەکاتەوەو سەرناگرن ﴿وإذا قاموا إلى الصلاة قاموا كسالى﴾ هەرکە دەچن بۆ نوێژ کردنیش دەبینی بە تەوەزەلی ڕاست ئەبنەوەو هەڵدەسن، چونکە بەتەمای پاداشت و خۆشنوودی خوا نین، هەروەك لەسوورەتی (التوبة: ٥٤): (ولا يأتون الصلاة إلا وهم كسالى) وە لەسورەتی (الماعون: ٤-٥): (فويل للمصلين الذين هم عن صلاتهم ساهون) ئەومەبەستە هاتووەو دووپاتکراوەتەوە. ﴿يراؤن الناس﴾ لەبەرامبەر خەڵکدا رووپامایی دەکەن و بۆ رووبینی نوێژ ئەکەن! تا پێیان نەڵێن کافرن ﴿ولا يذكرون الله إلا قليلا﴾ زۆر کەمیشیان یادی خوا دەکەن ﴿١٤٣ مذبذبين بين ذلك﴾ لەنێوان ئیمان و کوفردا دوو دڵن، هێمان خۆیان یەکلا نەکردۆتەوە، بۆیە هەم لەلای موسلمانەکاندا هەن و، هەم لەلای کافرەکانیش ﴿لاإلى هؤلاء ولاإلى هؤلاء﴾ نە ئەوەیە بچنە لای ئەمان و موسڵمان بن، نە ئەوەیشە بەیەکجاری خۆبدەنە لای ئەوان و کافربن، واتە: نەلەو لان و نەلەم لان، دەیانەوێ لەونێوانەدا هەردوولا ڕازی بکەن ﴿ومن يضلل الله فلن تجد له سبيلا﴾ دیارە ئەوانە گومڕاو ڕێ لێگوڕاون، هەرکەسێکیش خوا گومڕای بکات بەهۆی لاساریی ئەوکەسە خۆیەوە قەت تۆناتوانی هیچ ڕێگایەکی خێری نیشان بدەیت.

ڕێنمایەکانی ئایەتی(١٤٢-١٤٣):

پەسن و سیفاتی دووڕووەکان: تەمەڵی و سستی کردنە لەنوێژەکاندا، ئیمامی مالیك لەکتێبی (الموطأ)دا هێناویەتی: ((إن النبى ﷺ قال: تلك صلاة المنافقين -ثلاثا- يجلس أحدهم يرقب الشمس حتى إذا كانت بين قرني الشيطان، أو على قرني شيطان، قام فينقر أربعا لايذكر الله فيها الا قليلا)) دووڕووەکان پاڵی لێدەدەنەوەو لێی دادەنیشن هەتا خۆر هەڵدێ، پاشان بەپەلەو خافل و بێ ئاگا هەڵدەستن بۆنوێژەکەیان و، چوارجار دەنووك لەزەوی دەدەن و دەچن! ئەمە هەرپەسن و سیفەتی پیاوی دووڕوویە، ئەگەرنا موسڵمان نوێژەکانی لەکاتی خۆیاندان و زۆریش بەزەوق و خۆشییەوە هەڵدەستێ بۆیان، ئیمامی موسلیم ئەم فەرموودەیە دەهێنێ: ((مَثَلُ المُنافقِ كَمَثَلِ الشاةِ العائرَةِ بَيْنَ الغَنَمَيْنِ "المُتَرَددة بين قطيعين من الغنم" تَعيرُ الى هذه مَرَّة والى هذه أُخرى)). واتە: مرۆڤی دووڕوو هەر دەڵێی مەڕە شێتەیە، جارێ دەچێتە ناو ئەو مێگەلەکەو، جارێ دێتە ناو ئەم مێگەلەکە.

**خوانەناسان مەگرن بە دۆس:**

﴿١٤٤ يا أيها الذين آمنوا لا تتخذوا الكافرين أولياء من دون المؤمنين﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! بەدەر لەموسڵمانان خەڵکانی بێ باوەڕ بەدۆست و پشتیوانی خۆمەگرن ﴿اتريدون أن تجعلوا لله عليكم سلطانا مبينا﴾ ئاخۆ ئەتانەوێ بەڵگەیەکی ئاشکرا دژی خۆتان دەربارەی دووڕوویتان بدەنە دەستی خوا، جا ئەوکاتە دووچار بن؟

﴿١٤٥ إن المنافقين فى الدرك الأسفل من النار﴾ دیارەکە دووڕووەکان لەچینی هەرە خواری ئاگری دۆزەخدان ﴿ولن تجد لهم نصيرا﴾ و تۆش هەرگیز ناتوانیت یارمەتیدەرێکیان بۆ پەیداکەی ﴿١٤٦ إلا الذين تابوا وأصلحوا﴾ مەگەر ئەوانەی تەوبە بکەن و خۆ ساز بدەنەوە ﴿واعتصموا بالله﴾ و بەباشی دەست بەقاپی خواوە بگرن ﴿وأخلصوا دينهم

لله﴾ وله باتی رووپامایی کردن به پاکی ویەکلایی دینداری بۆخوا بکەن ﴿فأولئك مع المؤمنين﴾ ئەوسا لەبەهەشتدا لەگەڵ باوەڕداراندا ئەبن ﴿وسوف يؤت الله المؤمنين أجرا عظيما﴾ دیارە لە دوارۆژیشدا خوای گەورە پاداشێکی زۆر مەزن بە ئیماندارەکان دەدات ﴿[147] ما يفعل الله بعذابكم إن شكرتم وآمنتم﴾ خوا چ نیازو مەبەستێکی بەسزادانی ئێوە هەیە، ئەگەر ئێوە شوکرانە بژێرو سوپاسگوزاربن و باوەڕی دامەزراوتان هەبێت؟ واتە: خوا هەرگیز سزای بەندەی شوکرانە بژێرو باوەڕدار نادا ﴿وكان الله شاكرا عليما﴾ هەمووکات خوا پاداش دەرەوەی بەندە چاکەکانیەتی و، لەهەمووشتێکیش بەئاگاو زانایە، هەرکەسێ سوپاسگوزاری بێت و باوەڕی پێ هێنا بێت، ئەویش پاداشی بەچاکە دەداتەوە.

کۆتایی جزمی پێنجەم

و لله الحمد و المنة

*** *** ***



۞ لَّا يُحِبُّ اللَّهُ الْجَهْرَ بِالسُّوٓءِ مِنَ الْقَوْلِ إِلَّا مَن ظُلِمَ وَكَانَ اللَّهُ سَمِيعًا عَلِيمًا ﴿١٤٨﴾ إِن تُبْدُوا خَيْرًا أَوْ تُخْفُوهُ أَوْ تَعْفُوا عَن سُوٓءٍ فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ عَفُوًّا قَدِيرًا ﴿١٤٩﴾ إِنَّ الَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِاللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيُرِيدُونَ أَن يُفَرِّقُوا بَيْنَ اللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيَقُولُونَ نُؤْمِنُ بِبَعْضٍ وَنَكْفُرُ بِبَعْضٍ وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُوا بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ﴿١٥٠﴾ أُولَٰٓئِكَ هُمُ الْكَٰفِرُونَ حَقًّا وَأَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا ﴿١٥١﴾ وَالَّذِينَ ءَامَنُوا بِاللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَلَمْ يُفَرِّقُوا بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ أُولَٰٓئِكَ سَوْفَ يُؤْتِيهِمْ أُجُورَهُمْ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٥٢﴾ يَسْـَٔلُكَ أَهْلُ الْكِتَٰبِ أَن تُنَزِّلَ عَلَيْهِمْ كِتَٰبًا مِّنَ السَّمَآءِ فَقَدْ سَأَلُوا مُوسَىٰٓ أَكْبَرَ مِن ذَٰلِكَ فَقَالُوٓا أَرِنَا اللَّهَ جَهْرَةً فَأَخَذَتْهُمُ الصَّٰعِقَةُ بِظُلْمِهِمْ ثُمَّ اتَّخَذُوا الْعِجْلَ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ الْبَيِّنَٰتُ فَعَفَوْنَا عَن ذَٰلِكَ وَءَاتَيْنَا مُوسَىٰ سُلْطَٰنًا مُّبِينًا ﴿١٥٣﴾ وَرَفَعْنَا فَوْقَهُمُ الطُّورَ بِمِيثَٰقِهِمْ وَقُلْنَا لَهُمُ ادْخُلُوا الْبَابَ سُجَّدًا وَقُلْنَا لَهُمْ لَا تَعْدُوا فِي السَّبْتِ وَأَخَذْنَا مِنْهُم مِّيثَٰقًا غَلِيظًا ﴿١٥٤﴾



**بۆ غەدر لێکراو نەبێ ، ڕێ بە وشەی تاڵ و تفت نادرێ:**

ستەم لێکراو دەتوانێ هەموو قسەیەك لەڕووی ستەمکاردا بکات، ئەگەرچی لێبوردنیش پەسەندترو باشترە ، وەکو دەفەرموێ: ﴿[148] لايحب الله الجهر بالسوء من القول إلا من ظلم﴾ خوای گەورەو دلۆڤان هەرگیز پێی خۆش نییە هیچ کەسێك دەنگ بەرزکاتەوەو قسەی ناخۆش و ناحەز لەڕووی ئەم و ئەودا بکات، نابێ کەسێ نزای شەڕ لەکەسێ بکا، بەناوو ناتۆرەو، ناوی ناخۆش ناوی ببا، مەگین کەسێك ستەم و ناهەقیی لەگەڵکرابێت، ئەوحەلە ڕێی هەیە باسی هەقی خۆی بکاو، ناوی ستەمکارەکە بەرێت ، ئەگەرچی لەوکاتەشدا هەر بێدەنگی و ئارامگرتن باشترە، وەکو لەجێگای تردا دەفەرموێ: (ولمن انتصر بعد ظلمه فأولئك ما عليهم من سبيل) (شورا: ٤١). واتە: ئەوکەسانەی لەپاش ستەم لێکردن، تۆڵەی خۆیان دەسێننەوە، خەتابار نابن، لەفەرموودەشدا هاتووە: ((المُسْتَبّانِ ما قالا، فعلى البادئ منهما مالم يَعْتَدِ المَظْلُومُ)) ئەبوداود. واتە: ئەو دووکەسەیە کەجنێو بەیەکدی دەدەن، گوناحەکەی دەکەوێتە سەر دەسپێشخەرەکەیان، بەمەرجێ غەدر لێکراوەکە زیادەڕۆیی نەکا ﴿وكان الله سميعا عليما﴾ خوای گەورە هەمیشە بیسەرە، گشت قسەو وتوو وێژێك دەبیسێ، زانایە بەوی لەنێوانیاندا ڕوودەدات. ﴿[149] إن تبدوا خيرا أو تخفوه أو تعفوا عن سوء﴾ خۆئەگەر ئێوە چاکە بکەن، بەئاشکرابێ، یان بەنهێنی، یان لەکرداروڕەفتارێکی نالەبار چاوبپۆشن، لەگەڵ تواناو دەسەڵاتدا ﴿فإن الله كان عفوا قديرا﴾ بێ سۆ خوا هەمیشە دەسەڵاتدارە بۆ عافوو کردن و لێبوردن، لەفەرموودەشدا هاتووە: ((ما نقص مال من صدقة، ولا زاد الله عبدا بعفو إلا عزا، ومن تواضع لله رفعه الله)) موسلیم. واتە: هیچ ماڵ و دارایییەك لەبەخشین کەم

ناکا، هەر بەندەیەکیش عافوو بکا، هەمیشە سەربەرزە، ئەوی لەبەرخوا، خۆ بەکەمبزانێ و لەجێگای خۆی بێتە خوارێ، حەتمەن خوا بەرزی دەکاتەوە.

**حاشا لە هەندێ پێغەمبەران کوفری تەواوە:**

﴿١٥٠ إن الذين يكفرون بالله ورسله﴾ بێگومانە ئەوانەی وادڵیان دژی خواو پێغەمبەرەکانیەتی ﴿ويريدون أن يفرقوا بين الله ورسله﴾ و دەشیانەوێ لەنێوان خواو پێغەمبەرەکانییدا فەرق و جیاوازی دانێن ﴿ويقولون نؤمن ببعض ونكفر ببعض﴾ و دەڵێن: ئێمە باوەڕ بەهەندێکیان دەکەین، هەندێکیشیان بەجێی باوەڕ نازانین ﴿ويريدون أن يتخذوا بين ذلك سبيلا﴾ و دەشیانەوێ لەو نێوانەدا رێگەیەك بۆخۆیان دیاری بکەن ﴿١٥١ أولئك هم الكافرون حقا﴾ بێ دوودڵی، ئەمانە کافروخوا نەناسن، چونکە ئەو داوایەیان ناپەسەندە، وە بڕوا بوون بەخوا، بەگشت فەرمان و بڕیارەکانیشی دەبێ، ئەگینە ئەو داوایە، داخوازییەکی بێهوودەو بێ ناوەڕۆکە ﴿واعتدنا للكافرين عذابا مهينا﴾ وە ئێمە سزایەکی ئابڕوبەرمان بۆئەو خوانەناس و کافرانە، ئامادە کردووە، وەلە جێگای تریشدا دەفەرموێ: (وضربت عليهم الذلة والمسكنة وباؤا بغضب من الله..). (بەقەرە: ٦١) ﴿١٥٢ والذين آمنوا بالله ورسله ولم يفرقوا بين احد منهم﴾ ئەوانەش کە باوەڕیان هەیە بەخواو بەپێغەمبەرەکانی و لەناویانیشدا هیچ فەرق و جیاوازییەك ناکەن، وەك ئەم ئوممەتی موحەممەدە ﷺ کە بەڕاستیی بێ فەرق وسوون چوونە ژێر ئەرکی خۆیانەوە، وەکو لەجێگای تردا دەفەرموێ: (آمن الرسول بما انزل إليه من ربه والمؤمنون كل آمن بالله وملائكته وكتبه ورسله لانفرق بين أحد من رسله..). (بەقەرە: ٢٨٥). واتە: ئەم پێغەمبەرەو ئەوانەش لەگەڵ ئەو باوەڕیان هێناوە، گشت لێیان ڕوونە کە ئەوقورئانە لەلایەن پەروەردگاریانەوە هاتووەو، هیچ فەرقێکیش ناخەن لەناو پێغەمبەرەکانیا، بەڵکو باوەڕیان بەگشتیان هەیە. ﴿أولئك سوف يؤتيهم أجورهم﴾ ئەوانە لەدواڕۆژدا خوا پاداشی شیاوی خۆیانیان دەداتێ ﴿وكان الله غفورا رحيما﴾ و خواش گوناهپۆشە، لەتاوان و گوناهەکانیان دەبوورێ، میهرەبان و دلۆڤانە.

**ململانێ و عینادیی جوولەکە:**

﴿١٥٣ يسألك اهل الكتاب ان تنزل عليهم كتابا من السماء﴾ خاوەن نامەکان، داوات لێدەکەن کە کتێبێکی تایبەتیان لەئاسمانەوە بۆ بێنی، نووسرابێ بۆ فلانەکەس، هەروەکو چۆن تەورات بەکامڵی و گشت پێکەوە هات بۆموسا، دیارە (قوڕەیش)یش هەمان بیانوویان لێگرتی و گوتیان: (وقالوا لن نؤمن لك حتى تفجر لنا من الأرض ينبوعا) (ئیسراء: ٩٠). واتە: بڕوات پێناکەین تا لەم زەمینە کانییەکمان بۆ هەڵدەقوڵێنی. ﴿فقد سألوا موسى اكبر من ذلك﴾ بێ سۆ هەر ئەوانە مەزنترو گەورەتر لەوەیان لەمووسا خواست بوو: ﴿فقالوا أرنا الله جهرة﴾ گوتیان: دەبێ بەئاشکرا خوامان پێ نیشان بدەیت! ﴿فأخذتهم الصاعقة بظلمهم﴾ جا لەسزای ئەو قسە ناڕەواو ناهەقەییانەدا، هەورە تریشقەیەکی سەخت گرتنی، لەسوورەتی بەقەرەشدا هاتووە: (وإذ قلتم يا موسى! لن نؤمن لك حتى نرى الله جهرة فأخذتهم الصاعقة وانتم تنظرون .ثم بعثناكم من بعد موتكم لعلكم تشكرون) (٥٥- ٥٦). واتە: ئەوساش کە بەموساتان گوت: ئێمە بڕوات پێ ناهێنین تا بەئاشکرا خوا نەبینین! ئیتر هەر لەبەرچاو خۆتاندا برووسکە گرتنی، ئەوسا پاش ئەوەی مردن، زیندوومان کردنەوە، بەڵکو شوکرانە بژێر بن. ﴿ثم اتخذوا العجل من بعد ماجاءتهم البينات﴾ پاشانیش -دوای دیتنی چەند بەڵگەیەکی زۆر روون و ئاشکرا لەسەر دەستی مووسا- گوێرەکەیان پەرست، وەخوا لە زمان ئەوانەوە دەگێڕێتەوە کە گوتیان: (إجعل لنا إلها كما لهم آلهة) ئەعراف: ١٣٨. واتە: مووسا! خوایەکمان وەکو خواکانی ئەوان بۆ دابین بکە! ﴿فعفونا عن ذلك﴾ ئێمەش چاوپۆشیمان لێکردن ﴿وآتينا موسى

سلطانا مبينا﴾ بەڵگەو دەسەڵاتێکی ئاشکرامان دا بەمووسا. ﴿١٥٤ ورفعنا فوقهم الطور بميثاقهم﴾ بەهۆی پەیمانێ
کەدایان، کێوی (توور)مان لەسەریان بەرز ڕاگرت، پاش ئەو لاساریی و سەرلێشێواوییەیان ﴿وقلنا لهم ادخلوا الباب
سجدا﴾ پێمانگوتن: لەو دەرگاوە بەسوژدەوە بچنە ناو (بيت المقدس) وداوای لێبوردن لەخوا بکەن، کەچی
قسەکەیان شکاندین و، لەباتی ئەوە بڵێن (حِطّة) گوتیان ((حنطة في شعرة)). ﴿وقلنا لهم لا تعدوا في السبت﴾
پێشمان گوتن: لە ڕۆژی شەممەدا دەستدرێژی مەکەن و، سنوور مەشکێنن و، بەو یاسایە ڕەفتار بکەن بۆتان
دیاریکراوە ﴿واخذنا منهم ميثاقا غليظا﴾ پەیمانێکی بەهێزو پتەویشمان لێ سەندن کە لاساری نەکەن، کەچی
نەیانبردە سەر، وەکو لەسوورەتی ئەعرافدا زیاتر ڕوونکراوەتەوە لەسەرەتای ئایەتی (١٦٣): (واسألهم عن القرية
التي كانت حاضرة البحر) واتە: دەربارەی ئەو شارە —
گوندی (ئەیلە) کە دەکەوێتە قەراخی دەریاوەو نێوان شاری
(مەدیەن) و کێوی (توور)ەوە- لێیان پرسە؟

**تاوانەکانی جوولەکە:**

﴿١٥٥ فبما نقضهم ميثاقهم وكفرهم بآيات الله وقتلهم
الأنبياء بغير حق وقولهم قلوبنا غلف﴾ ئەوجا لەبەر پەیمان
شکاندنیان و باوەڕ نەبوونیان بەنیشانەکانی خواو لەناهەق
کوشتنی پێغەمبەرانیان و گوتەیان: ئێمە دڵمان داخراوە
(بەر جەزرەبەو نەفرینی خوا کەوتن). وەکو لەجێگای تردا
دەفەرموێ: (وقالوا قلوبنا في اكنة مما تدعونا إليه). ﴿بل
طبع الله عليها بكفرهم﴾ نا دڵیان دانەخراوە، هەر خوا خۆی
دڵی مۆر کردوون و قەت خێرو قسەی باش وەرناگرێ،
چونکە قەومێکی نالەبارو لارن ﴿فلا يؤمنون إلا قليلا﴾ ئیتر
بەشێ کەمیان نەبێ باوەڕ ناهێنن.

الجزء السادس — سورة النساء

فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَٰقَهُمْ وَكُفْرِهِم بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَقَتْلِهِمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ
بِغَيْرِ حَقٍّ وَقَوْلِهِمْ قُلُوبُنَا غُلْفٌۢ ۚ بَلْ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَيْهَا بِكُفْرِهِمْ
فَلَا يُؤْمِنُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٥٥﴾ وَبِكُفْرِهِمْ وَقَوْلِهِمْ عَلَىٰ مَرْيَمَ
بُهْتَٰنًا عَظِيمًا ﴿١٥٦﴾ وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا ٱلْمَسِيحَ عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ
رَسُولَ ٱللَّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ ۚ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ
ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ ۚ مَا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ إِلَّا ٱتِّبَاعَ ٱلظَّنِّ ۚ
وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًۢا ﴿١٥٧﴾ بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيْهِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا
﴿١٥٨﴾ وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ ۖ وَيَوْمَ
ٱلْقِيَٰمَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا ﴿١٥٩﴾ فَبِظُلْمٍ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُوا۟
حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَٰتٍ أُحِلَّتْ لَهُمْ وَبِصَدِّهِمْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ
كَثِيرًا ﴿١٦٠﴾ وَأَخْذِهِمُ ٱلرِّبَوٰا۟ وَقَدْ نُهُوا۟ عَنْهُ وَأَكْلِهِمْ أَمْوَٰلَ ٱلنَّاسِ
بِٱلْبَٰطِلِ ۚ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ مِنْهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٦١﴾ لَّٰكِنِ
ٱلرَّٰسِخُونَ فِى ٱلْعِلْمِ مِنْهُمْ وَٱلْمُؤْمِنُونَ يُؤْمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ
أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ ۚ وَٱلْمُقِيمِينَ ٱلصَّلَوٰةَ ۚ وَٱلْمُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ
وَٱلْمُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ أُو۟لَٰٓئِكَ سَنُؤْتِيهِمْ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١٦٢﴾

١٠٢

**بوختانی جوولەکە دەربارەی (مەریەم) و لاف لێدانی کوشتنی عیسا عليه السلام:**

﴿١٥٦ وبكفرهم وقولهم على مريم بهتانا عظيما﴾ لەبەر
کافر بوون و ئەو بوختانە گەورەیان بۆ خاتوونە (مەریەم)یانکرد، گوایا زینای کردبێت! ﴿١٥٧ وقولهم إنا قتلنا
المسيح عيسى ابن مريم رسول الله﴾ وە لەبەرئەوەش کە دەیانگوت: ئێمە عیسای کوڕی مەریەممان کوشت کە
پێغەمبەری خوایە، خوای گەورە بەدرۆیان دەخاتەوەو دەفەرمووێ: ﴿وما قتلوه وما صلبوه ولكن شبه لهم﴾ کەچی
نە توانییان بیکوژن و، نە توانیشیان لەقەنارەی بدەن، وەکو خۆیان کردیانە هەرا، بەڵکو سەریان لێ تێکچوو بوو،
پیاوێکیان دێت لەبیچمو شکڵدا وایان زانی (عیسا)یەو لەقەنارەیان دا ﴿وإن الذين اختلفوا فيه لفي شك منه﴾ وە
ئەوانەی دەربارەی ئەو کێشەیانە، لەدوودڵیدان ﴿مالهم به من علم إلا اتباع الظن﴾ هیچ زانستیەکیان بەوە نییە، جگە
لەشوێنکەوتی گومان نەبێ، بۆیە دەفەرمووێ: ﴿وما قتلوه يقينا﴾ بەیەقین و بێگومان نەیانکوشتووە ﴿١٥٨ بل رفعه
الله إليه﴾ بەڵکو خوای گەورە بەرەو خۆی بەرزی کردەوە، لەسوورەتی (ئالی عیمران: ٥٥)دا، ئەم مەسەلەی بەرز

کردنەوەی (عیسا)یە، درێژتر باسکراوە، جابۆ پتر تێگەیشتن و بەئاگابوونت لێی، دەتوانی بگەڕێیتەوە لای ﴿وكان الله عزيزا حكيما﴾ خواش هەمیشە و بەردەوام بەدەسەلات و کارزانە، خۆی دەزانێ چی دەکات، هەرکەسێك پەنای پێبرد، دەیپارێزێ و، سەری دەخات. ﴿[١٥٩] وإن من أهل الكتاب إلا ليؤمن به قبل موته﴾ کاتێ عیسا لەئاسمان دێتە خوارێ، گشت خاوەن کتێبەکان بەر لەمەرگی عیسا بڕوای پێدێنن. (بوخاریی) ئەم فەرموودەیەی هێناوە: ((والذى نفسى بيده، ليَوشِكَنّ أن ينزل فيكم ابن مريم حكَما عَدْلا، فيَكْسِرَ الصليبَ، ويقتُلَ الخنزيرَ، ويَضعَ الجزيةَ، ويَفيضَ المالُ حتى لا يَقْبَلَه أحد، حتى تكونَ السجدةُ خيرا من الدنيا ومافيها)) فتح البارى: ٥٦٦/٦). واتە: سوێندم بەوی گیانی منی بەدەستە، خەریکە کوڕەکەی مەریەم ﷺ بێتە خوارەوە بۆناوتان، ئەوسا ببێتە داوەرێکی دادگەرو دادپەروەرو، خاچ (صەلیب) بشکێنێ و، بەراز نەهێڵێ و بیکوژێ و، سەرانە هەڵبگرێ و ژیان و بژێویش ئەوەندە زۆرببێ، کەسێك نەبێ شتێك لەکەسێکی تر وەرگرێت، هەتا تەنها سوژدەیەك "بۆخوا بەرن" لەگشت دنیا چاکتر دەبێت. ﴿ويوم القيامة يكون عليهم شهيدا﴾ وە لەرۆژی بەرێدا (عیسا) دەبێتە شایەت لەسەریان، کەپەیامەکەی خوای گەورەی بەرێکوپێکی پێگەیاندوون و، تێیشیگەیاندوون کە ئەو بۆخۆی بەندەی خوای تاكو تەنیایە، نەك کوڕو رۆڵەی خوا، وەکو ئەوان دەڵێن . وەلەکۆتایی سوورەتی (مائیدە: ١١٦)شدا دەفەرمووێ: (وإذ قال الله يا عيسى ابن مريم أأنت قلت للناس اتخذونى وأمى إلهين من دون الله..) واتە: ئەوکاتەش وەبیربێنە کەخوا بەعیسا دەڵێ: ئەرێ عیسای کوڕی مەریەم! تۆ بەو خەڵکەت گوتووە: کەدەبێ - غەیرەز خوا- تۆو دایکت وەکو دوو خوا بپەرستن؟.

### لەبەر ناهەقیکاری جوولەکە نازو نیعمەتێکی زۆریان لەسەر حەرام کرا:

﴿[١٦٠] فبظلم من الذين هادوا حرمنا عليهم طيبات أحلت لهم﴾ لەبەر ئەوستەم و ناهەقیەی جوولەکە کردیان، چەندین شتی حەلاڵ و رەوامان لەسەر قەدەغە کردن و بێبەشبوون لێی ﴿وبصدهم عن سبيل الله كثيرا﴾ وە لەبەرئەوەش کە زۆرکەسیان لەڕێگەی خوا وەرگەڕان وڕێیان لێگرت، وەك لەسوورەتی ئالی عیمران دا دەفەرمووێ: (كل الطعام كان حلا لبنى إسرائيل إلا ما حرم إسرائيل على نفسه من قبل أن تنزل التوراة ..) ئایەتی: ٩٣. واتە: هەموو جۆرە خواردەمەنییەك بۆ کوڕان و نەوەی ئیسرائیل رەوابوو، بێ لەوەی کە ئیسرائیل (یەعقوب) پێش هاتنی تەورات خۆی لێلاداو پارێزی لێکرد، ئەوسا ئەمانیش لەبەر ناهەقیی خۆیان گەڵێ رزق و رۆزییان لێگیرایەوە، وەك دفەرمووێ: (وعلى الذين هادوا حرمنا كل ذى ظفر ومن البقر والغنم حرمنا عليهم شحومهما إلا ما حملت ظهورهما أو الحوايا أو ما أختلط بعظم ذلك جزيناهم ببغيهم وانا لصادقون) (ئەنعام: ١٤٦) واتە: ئێمە گشت زیندەوەری نینۆکدارو پیوی گاو مەڕمان لەمووساییەکان قەدەغە کرد، پیوێ نەبێ بەپشت ئەوانەوە بێت، یان لەگەڵ ریخۆڵەکانیان بێ، یان ئەو پیوە تێکەڵ بە ئێسکیان بووبێت، ئەو تۆڵەیەش چونکە ناهەقبوون و لەرێی راست کلابوون و لایاندا، بێ سۆ ئێمە ڕاست دەکەین. ﴿[١٦١] واخذهم الربا وقد نهوا عنه واكلهم أموال الناس بالباطل﴾ وە لەبەر سوود خواردنیان، کەڕێیان لەخواردنی گیرابوو، هەروەها لەبەر خواردنی دارایی مەردم بەفیڕۆو هەوانتە ﴿واعتدنا للكافرين منهم عذابا اليما﴾ ئێمەش بۆ ئەوکافرو سپڵانە سزایەکی بەژانمان ئامادە کردووە. ﴿[١٦٢] لكن الراسخون فى العلم منهم﴾ بەڵام مەلا زۆر زاناکانیان ﴿والمؤمنون﴾ و خەڵکە بڕوادارەکەیان ﴿يؤمنون بما انزل إليك وما انزل من قبلك﴾ بڕوایان بەو کتێبە هەیە بۆ تۆ نێردراوەتە خوارەوەو، وە بەوەش باوەڕیان هەیە وا بەرلەتۆ نێردراوە ﴿والمقيمين الصلاة﴾ بەتایبەت ئەوانەی وابەباشی نوێژ بەجێ دێنن ﴿والمؤتون الزكاة والمؤمنون بالله

والیوم الآخر﴾ هەروەها زەکات دەرانیان و، ئەوانەشیان بەخواو بەڕۆژی بەرێ باوەڕیان هەیە ﴿اولئك سنؤتیهم اجرا عظیما﴾ بێگومان بەوانە پاداشێکی گەورەو گرنگ دەبەخشین، واتە: بەهەشتیان دەدەینێ.

**بۆ تۆو بۆ پێغەمبەرانی تر، چوونیەك وەحییمان کرد:**

﴿^١٦٣ إنا اوحینا إلیك كما اوحینا إلى نوح والنبیین من بعده﴾ ئێمە وەحیمان بۆ تۆ کرد، هەروەکو بۆ (نووح) و پێغەمبەرانی دوای ئەویشمان کرد ﴿واوحینا إلى إبراهیم وإسماعیل وإسحاق ویعقوب والأسباط وعیسى وأیوب ویونس وهارون وسلیمان﴾ هەروەها بۆ (ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و نەوەکانی و عیساو ئەیووب و یونس و هاروون و سولەیمان)یشمان کردو بەرنامەی ئیش و کاریانمان تێگەیاندن ﴿وآتینا داود زبورا﴾ (زەبوور)یشمان بەخشی بە (داود) (علیهم الصلاة والسلام).

**بیست و پێنج پێغەمبەر ناویان لە قورئاندا هاتووە:**

﴿^١٦٤ ورسلا قد قصصناهم علیك من قبل﴾ وە لەپێشەوە چەند پێغەمبەرێکی تریشمان ناردووە، ئەوانە هێندێکیان بوون کە لەئایەتی (١٦٣) دا باسکران ﴿ورسلا لم نقصصهم علیك﴾ و پێغەمبەر گەلێکی تریش هەن، کە لەقورئاندا بۆم باس نەکردویت .

تێبینی: ئەمانەیش ئەوپێغەمبەرانن لەقورئاندا ناویان هاتووە: (ئادەم، ئیدریس، نووح، هوود، صالح، ئیبراهیم، لووت، ئیسماعیل، ئیسحاق، یەعقووب، یووسف، ئەیووب، شوعەیب، مووسا، هاروون، یونس، داوود، سولەیمان، ئیلیاس، ئەلیەسەع، زەکەریا، یەحیا، عیسا، زەلکیفل، پێغەمبەرمان موحەممەد سەلاویان لێ بێت. ﴿وكلم الله موسى تكلیما﴾ خوای میهرەبان بۆ خۆی ڕاستەوخۆ قسەی لەگەڵ مووسادا کردووە، بۆیە پێی دەگوترێ (کەلیم).

الجزء السادس | سورة النساء

إِنَّآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ كَمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ نُوحٖ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعۡدِهِۦۚ
وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ
وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَعِيسَىٰ وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَٰرُونَ وَسُلَيۡمَٰنَۚ
وَءَاتَيۡنَا دَاوُۥدَ زَبُورٗا ١٦٣ وَرُسُلٗا قَدۡ قَصَصۡنَٰهُمۡ عَلَيۡكَ
مِن قَبۡلُ وَرُسُلٗا لَّمۡ نَقۡصُصۡهُمۡ عَلَيۡكَۚ وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ
تَكۡلِيمٗا ١٦٤ رُّسُلٗا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ
لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةُۢ بَعۡدَ ٱلرُّسُلِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمٗا
١٦٥ لَّٰكِنِ ٱللَّهُ يَشۡهَدُ بِمَآ أَنزَلَ إِلَيۡكَۖ أَنزَلَهُۥ بِعِلۡمِهِۦۖ
وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَشۡهَدُونَۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ١٦٦ إِنَّ ٱلَّذِينَ
كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ قَدۡ ضَلُّواْ ضَلَٰلَۢا بَعِيدًا
١٦٧ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَظَلَمُواْ لَمۡ يَكُنِ ٱللَّهُ لِيَغۡفِرَ لَهُمۡ وَلَا
لِيَهۡدِيَهُمۡ طَرِيقًا ١٦٨ إِلَّا طَرِيقَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۚ
وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٗا ١٦٩ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَكُمُ
ٱلرَّسُولُ بِٱلۡحَقِّ مِن رَّبِّكُمۡ فَـَٔامِنُواْ خَيۡرٗا لَّكُمۡۚ وَإِن تَكۡفُرُواْ
فَإِنَّ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمٗا ١٧٠

يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ | ١٠٤

**بۆچی پێغەمبەران ڕەوانە کران؟**

﴿^١٦٥ رسلا مبشرین ومنذرین لئلا یكون للناس حجة بعد الرسل﴾ گشتیان پێغەمبەری مژدەدەرو ترسێنەر بوون، تا دوای ئەو پێغەمبەرانە هیچ بەڵگە و بیانوویەك بۆ ئەوخەڵکەیە نەمێنێ لەلای خوا، ئەگەر لارو لاسار بوون ﴿وكان الله عزیزا حكیما﴾ خوا خۆی گشت کات دەسەڵاتدارە، لەکارزانە، وەك دەفەرموێ: (ولوانا اهلكناهم بعذاب من قبله لقالوا ربنا لولا ارسلت إلینا رسولا فنتبع آیاتك من قبل ان نذل ونخزى) طه/١٣٤. واتە: ئەگەر ئێمە بەر لەم قورئانە ئەوانمان بەسزایەك لەناو بردبا، دەیانگوت: ئەی پەروەردگارمان! بەر لەوە ئێمە ریسواو سەرشۆڕو زەلیل ببین، بۆچی تۆ پێغەمبەرێکی خۆتت نەنارده لامان شوێنی ئایەت و نیشانەکانی بکەوتباین ؟ پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((لا احدَ اغیرُ من الله، من اجل ذلك حرم الفواحش ما ظهر منها وما بطن، ولا احدَ احبُ إلیه المدح من الله عز وجل-من اجل ذلك مدح نفسه، ولا احدَ احبُ إلیه العذر من الله، من اجل ذلك بعث النبیین مبشرین ومنذرین)) وفی لفظ (من اجل ذلك ارسل رسله وانزل

کتبه) فتح الباریٔ /١٤٦/٨). واته: هیچ کەسێ نییە لەخوا بەغیرەتتر بێت، هەر بۆیەش کاری نەشیاوو دزێوی بەئاشکراو نهێنی ڕەوا نەدا، کەسێکیش نییە بەقەدەر ئەوسوپاس وستایشی پێخۆش بێت، هەر بۆیە (مەدح)ی خۆی دەکا، وە هیچ کەسێك نییە بەئەندازەی خوا (عوزر)و پۆزشی لاخۆش بێت، هەر لەبەرئەوەبوو گشت پێغەمبەرانی بەمژدەدەرو ترسێنەر ناردو کتێبیشی لەتەك ناردن. ﴿<sup>١٦٦</sup> لکن الله یشهد بما انزل إلیك انزله بعلمه﴾ بەڵام خوای کارجوان ئاگاداره کە ئەو قورئانەی بەزانست و زانیاریی خۆی دابەزاندووە بۆت ﴿والملائکة یشهدون﴾ وفریشتەکانیش ئاگایان لێیەو چاك دەزانن کە خوا موحەممەدی کردووە بەپێغەمبەر و، ئەو قورئانەشی بۆناردووە، ئەگەرچی خەڵکیش قرە قرو دەمبازی بکەن! خوای گەورە بۆخۆی لەسوورەتێکی تردا دەفەرمووێ: (لا یأتیه الباطل من بین یدیه ولا من خلفه تنزیل من حکیم حمید). ﴿وکفی بالله شهیدا﴾ ئاگاداربوونی خوای گەورە بەسە بۆئەو ڕاستییە ﴿<sup>١٦٧</sup> إن الذین کفروا وصدوا عن سبیل الله﴾ بەڕاستیی ئەوانەی بێ باوەڕن و ڕێگەی ڕاستی خوا لەخەڵك دەگرن و ناهێڵن شوێنی هەق کەون ﴿قد ضلوا ضلالا بعیدا﴾ بێسۆ لە ڕادە بێ باوەڕن و ڕێیان گوم کردووە و سەرلێشێواون ﴿<sup>١٦٨</sup> إن الذین کفرواو ظلموا﴾ بێ سۆ ئەوانەی لەدینی خوا لایانداو کاری ناهەقیی و ستەمیان کرد ﴿لم یکن الله لیغفر لهم ولا لیهدیهم طریقا﴾ ئەوە خوا نەلێیان خۆش دەبێ و، نەڕێگەیەکیان نیشان دەدا بۆ خێرو چاکەکردن ﴿<sup>١٦٩</sup> إلا طریق جهنم خالدین فیها ابدا﴾ بەڵام ڕێی جەهەندەم ئامادەیە بۆیان و، بەهەتاهەتایی تیا قەتیس دەمێننەوە ﴿وکان ذلك علی الله یسیرا﴾ ئەوەش بۆخوا زۆر ئاسانە ﴿<sup>١٧٠</sup> یاأیهاالناس قدجاءکم الرسول بالحق من ربکم﴾ خەڵکینە! ئەم پێغەمبەرە موحەممەد ﷺ بەئایینێکی هەق و ڕاستەوە لەلایەن پەروەردگارتانەوە هاتۆتە لاتان ﴿فآمنوا خیرا لکم﴾ دەسا باوەڕی پێ بێنن، خێرو قازانجتانە ﴿وإن تکفروا فإن لله ما فی السموات والأرض﴾ خۆئەگەر کافرو خوانەناس بن و پەیڕەوی لێنەکەن، ئەوە چاك بزانن هەرشتێ لەئاسمان و زەویدایە هی خوایەو، لەموڵکی ئەوەهیچ کەمناکاو، ئێوەیش لەدەستی دەرناچن، لەجێگایەکی تردا دەفەرموێ: (وقال موسی إن تکفروا أنتم ومن فی الأرض جمیعا فإن الله لغنی حمید) ﴿وکان الله علیما حکیما﴾ خواش هەمیشە زانای کار ڕەوان و لەکارزانە.

**زێدەڕۆیی لە شانی عیسادا:**

﴿<sup>١٧١</sup> یاأهل الکتاب لا تغلوا فی دینکم ولا تقولوا علی الله إلا الحق﴾ ئەی خەڵکانی خاوەننامە! هەڵەڕۆیی و زێدەڕۆیی لەدینەکەتاندا مەکەن، شتێ ڕاست نەبێ ، ئێوە دەربارەی خوا مەڵێن. فەلەکان دەربارەی مەسەلەی عیسا ؈ زۆر لەسنوور دەرچوون و، گەیاندیانە ڕادەی خواو بەخوا زانین! پێغەمبەریش ﷺ ئەفەرموێ: ((لا تُطْرونی کما أَطْرَتِ النصاری عیسی ابنَ مریم، فإنما انا عبد، فقولوا: عبدالله ورسوله)) احمد ٢٣/١. ئیمامی بوخاریش بەم شێوەیە ئەم فەرموودەیەی هێناوە: ((فإنما انا عبد فقولوا: عبدالله ورسوله) فتح الباریٔ/٥٥١/٦. واتە: خەڵکینە! لەبارەی منەوە زێدەڕۆیی مەکەن، وەکو گاورەکان دەربارەی عیسا هەڵەڕۆییان کردو ئەوەندەیان پیا هەڵدا، کردیانە کوڕی خوا! بەڕاستیی من تەنها بەندەیەکم، ئێوەش لەوبارەی منەوە هەر ئەوەندە بڵێن کە: من تەنها بەندەو ڕەوانەکراوی خوام ﴿إنما المسیح عیسی ابن مریم رسول الله وکلمته القاها إلی مریم وروح منه﴾ (مەسیح کوڕی مەریەم) هەر پێغەمبەری خوا بووە، خوای بەتوانا وشەی خۆی هاویشتە ناو پزدانی مەریەم و گیانێکیشە لە خواوە، (جوبریل)ی نارد بۆ ئەنجامدانی ئەوکارە، ئەویش هەرچۆنی پێی سپێردرابوو کارەکەی ئەنجامدا، وەکوخوا بۆخۆیشی لەسوورەتیکی تردا دەفەرموێ: (ماالمسیح ابن مریم إلا رسول قد خلت من قبله الرسل وأمه صدیقة کانا

یأکلان الطعام ..) مائیدە: ٧٥. یان دەفەرموێ: (إن مثل عیسى عند الله کمثل آدم خلقه من تراب ثم قال له کن فیکون) ئالی عیمران: ٥٩. واتە: نموونەی (عیسا)ش بەلای خواوە، هەر لەنموونەی ئادەمە، لەگڵ دروستی کردوو پاشان پێیگوت: ببە بە ئادەم، ئەویش خێرابوو، عیساشی هەر ئاوا دروستکرد، ئێوەیش لەوە بەولاوە مەچن، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((من شهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، وأن محمدا عبده ورسوله، وأن عيسى عبدالله ورسوله وكلمته ألقاها إلى مريم وروح منه، وإن الجنة حق، والنار حق، أدخله الله الجنة على ماكان من العمل) فتح الباریٔ ٥٤٦/٦. واتە: ئەوی ئەو شایەتیە بدات کە: غەیرەز خوا خوایەکی تر نییە شیاوی پەرستن بێت، تاك و تەنیاو بێ شەریك و بێ هاوبەشە، موحەممەدیش ﷺ بەندەی خوایەو خۆی ناردوویەتی، عیساش بەندەو پێغەمبەری خوایەو ئەو ناردوویەتی و بەبڕیارو فەرمانی ئەوبووەو هاویشتوویەتی یزدانی خاتوونە مەریەم و، رۆحێکە لەلایەن خۆیەوەو، ددانیش بنێت بەڕاستی و دروستیی بەهەشت و دۆزەخدا.. ئیتر بێ سۆ "کارو کرداری هەرچۆنی بێت" خوای گەورە دەیباتە بەهەشتەوە ﴿فآمنوا بالله ورسله﴾ دەسا ئێوە باوەڕ بێنن بەخواو بەپێغەمبەرانی ئەو ﴿ولا تقولوا ثلاثة﴾ مەڵێن سێ خوا هەیە، واتە عیساو دایکی مەکەنە هاوبەشی، بۆیە لەسوورەتی مائیدەشدا دەفەرمووێ: (لقد کفرالذين قالوا إن الله ثالث ثلاثة وما من إله إلا اله واحد..) مائیدة: ٧٣. واتە: ئەوانەی کە گوتیان خوا سێهەمینە لەسێ خوایان، بێگومان لەدین لایانداوە، جگە لەخوای تاك و تەنیا هیچ کەس بۆپەرستن ناشێ، وە دەربارەی ئەوانەش پێیان وابوو خوابوو فەرمووی: (لقد کفرالذين قالوا إن الله هو المسيح ابن مريم..) (مائیدة: ٧٢). ﴿انتهوا خيرا لكم﴾ کۆتایی بەو قسانە بێنن، بۆ ئێوە باشترە ﴿إنما الله إله واحد﴾ بێ شك هەر (الله) تاکە خوایە ﴿سبحانه أن يكون له ولد﴾ پاك و بێخەوشە لەو تۆمەتە کە: منداڵی هەبێ ﴿له مافی السموات ومافی الأرض﴾ هەرچی لەناو ئاسمانەکان و زەوییدایە هەرهی ئەوە ﴿وكفى بالله وكيلا﴾ وخواش هەر خۆی بەسە بۆپێکهێنانی کاروبارو، بەڕێوەبردنی بوونەوەر، هیچ پێویستییەکی بەعیساو خەڵکی تر نییە.

الجزء السادس — سورة النساء

يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَا تَغۡلُواْ فِي دِينِكُمۡ وَلَا تَقُولُواْ
عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡحَقَّۚ إِنَّمَا ٱلۡمَسِيحُ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ رَسُولُ
ٱللَّهِ وَكَلِمَتُهُۥٓ أَلۡقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرۡيَمَ وَرُوحٞ مِّنۡهُۖ فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ
وَرُسُلِهِۦۖ وَلَا تَقُولُواْ ثَلَٰثَةٌۚ ٱنتَهُواْ خَيۡرٗا لَّكُمۡۚ إِنَّمَا ٱللَّهُ إِلَٰهٞ
وَٰحِدٞۖ سُبۡحَٰنَهُۥٓ أَن يَكُونَ لَهُۥ وَلَدٞۘ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلٗا ﴿١٧١﴾ لَّن يَسۡتَنكِفَ
ٱلۡمَسِيحُ أَن يَكُونَ عَبۡدٗا لِّلَّهِ وَلَا ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ ٱلۡمُقَرَّبُونَۚ
وَمَن يَسۡتَنكِفۡ عَنۡ عِبَادَتِهِۦ وَيَسۡتَكۡبِرۡ فَسَيَحۡشُرُهُمۡ
إِلَيۡهِ جَمِيعٗا ﴿١٧٢﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ
فَيُوَفِّيهِمۡ أُجُورَهُمۡ وَيَزِيدُهُم مِّن فَضۡلِهِۦۖ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ
ٱسۡتَنكَفُواْ وَٱسۡتَكۡبَرُواْ فَيُعَذِّبُهُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا وَلَا
يَجِدُونَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرٗا ﴿١٧٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ
قَدۡ جَآءَكُم بُرۡهَٰنٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكُمۡ نُورٗا مُّبِينٗا ﴿١٧٤﴾
فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَٱعۡتَصَمُواْ بِهِۦ فَسَيُدۡخِلُهُمۡ
فِي رَحۡمَةٖ مِّنۡهُ وَفَضۡلٖ وَيَهۡدِيهِمۡ إِلَيۡهِ صِرَٰطٗا مُّسۡتَقِيمٗا ﴿١٧٥﴾

١٠٥

**پێغەمبەران و فریشتەکان لەبەندایەتی خوا حاشا ناکەن:**

﴿[١٧٢] لن يستنكف المسيح أن يكون عبدا لله ولا الملائكة المقربون﴾ مەسیح هەرگیز لەوە حاشای نەکردووە کە عەبدو بەندەی خوایە، بەڵکو شانازی کردووە بەندەی خوابێ و قەت خۆی بەگەورەو زل نەزانیوە لەئاستی بەندایەتی خوادا، هەروەها ئەو فریشتانەی نزیکن بەخواشەوە، بۆیە دەفەرمووێ: ﴿ومن يستنكف عن عبادته ويستكبر﴾ هەرکەسێك بەبەندایەتی خوای گەورە ڕازی نەبێ و فیزو دەعیە بنوێنێ ﴿فسيحشرهم إليه جميعا﴾ بێگومان خوا

هەموویان لای خۆی کۆدەکاتەوە، ڕۆژی سەڵا داوەرییان دەکاو هەق و ناهەق لێك دەکاتەوە ﴿[١٧٣] فاما الذين آمنوا وعملوا الصالحات فيوفيهم اجورهم ويزيدهم من فضله﴾ جا ئەوانەی خاوەن باوەڕو کارچاکن، ئەوە بێ لەپاداشی خۆیان، خوا پتر چاکەیان لەگەڵ دەکا ﴿واما الذين استنكفوا واستكبروا﴾ بەڵام ئەوانەی کە لەخوا لایانداوەو لووتیان بەرز بووە ﴿فيعذبهم عذابا اليما﴾ ئینجا خوا سزاو جەزرەبەی بەئێش و بەژانیان دەدا ﴿ولا يجدون لهم من دون الله وليا ولا نصيرا﴾ هیچ دۆست و یارمەتیدەرێکیان نابێ – جگە لەخوا- وەخواش دۆستو یاریدەریان نیە.

**پەسنەکانی قورئان:**

﴿[١٧٤] ياايها الناس قد جاءكم برهان من ربكم﴾ ئەی خەڵکینە! لەپەروەردگارتانەوە بەڵگەیەکی گەورەو مەزنتان بۆهاتووە، تاهیچ کەسێك بروبیانووی نەمێنێ ﴿وانزلنا إليكم نورا مبينا﴾ و نوورو ڕۆشنایەکی ئاشکرامان دابەزاندووە بۆتان، دیارە مەبەست لە و(بورهان)و (نوور)ـە، قورئانی پیرۆزە ﴿[١٧٥] فاماالذين آمنوا بالله واعتصموا به﴾ ئینجا ئەوانەی باوەڕیان هێناو، دەستیان گرت بەرشتەی خواوە ﴿فسيدخلهم فی رحمة منه و فضل﴾ جابە تەئکید خواش دەیانخاتە بەر ڕەحمەت و بەزەیی خۆی و پتریش ﴿و يهديهم إليه صراطا مستقيما﴾ وە بەرەولای خۆی شارەزای ڕێی ڕاستیان دەکا. بەڵێ هەمووکات موسڵمان دەزانی ڕێی ڕاست لەکوێیەو، هەر لەوێیشەوە هەنگاو هەڵدەگرێت، چونکە خاوەنی (نوور) و (بورهان)ـە.

**کەسێك بمرێ نەباب و نە منداڵی هەبێ (کەلالە):**

﴿[١٧٦] يستفتونك﴾ لێت دەپرسن: دەربارەی کەسێ باوك و منداڵی نییەو دەمرێ، چی بکەن بە کەلەپوورەکەی؟ (جابیر) دەڵێ: جارێکیان نەخۆشبووم و پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە سەرەخۆشیم و، لەوکاتەدا بێهۆش کەوتبووم، پاشان دەستنوێژی دەگرێ و لە ئاوی دەستنوێژەکەم – بەفەرمانی خۆی- لێ دەپرژێنێن و بەهۆش دێمەوە, جا ئاگادار بووم ئەوپرسیارەیان لێکرد، ئەوجا خوایش ئایەتی میراتی نارد، ئەحمەد: ٢٩٨/٣. دیارە ئەم ئایەتی (يستفتونك..) وەکو زاناکان دەڵێن دواهەمین ئایەتە هاتووە ﴿قل الله يفتيكم فی الكلالة﴾ پێیان بڵێ: خوا خۆی وەڵامی ئەوەتان دەداتەوە. جا بۆ تەفسیری (کەلالە) هێندێ دەڵێن: بەکەسێك دەڵێن کە نەباوك و نەمنداڵی هەیەو دەمرێ، هێندێکی دی دەڵێن: ئەوکەسەیە کە تەنها منداڵی نەبێ وبمرێ، وەکو ئەم ئایەتەی بەردەستمان دەفەرموێ: ﴿إن إمرؤا هلك ليس له ولد﴾ ئەرکەسێك مردو هیچ منداڵی نەبوو ﴿وله اخت فلها نصف ماترك﴾ هەر تەنها خوشکێکی هەبوو ئەوە نیوەی میراتەکەی دەبا ﴿وهو يرثها إن لم يكن لها ولد﴾ خۆئەگەر خوشکەکەش بمرێ و، هیچ منداڵی لەپاش نەبوو، ئەوە براکەی تەواوی میراتەکەی دەبا ﴿فإن كانتا اثنتين فلهما الثلثان مما ترك﴾ خۆئەگەر هەرئەو مردووە، دوو خۆشکی لێ بەجێمان، ئەوە دووبەشیان لەسێ بەشی بۆهەیە، هەروەهاش ئەگەر لەدوو خۆشك زیاتر بوون ﴿وإن كانوا إخوة رجالا ونساء﴾ خۆئەگەر چەند خوشك و چەند برایەك لەپاش مردووەکە جێمانو هیچ منداڵیشی نەبوو ﴿فللذكر مثل حظ الأنثيين﴾ ئەوە هەر نێرینەی دوو ئەوەندەی مێینە میراتی بەردەکەوێ ﴿يبين الله لكم ان تضلوا﴾ خوای گەورە ئەو یاسایەتان بۆ روون دەکاتەوە، نەوەکو لێتان تێك بچێ و مافی یەکتر زەوت بکەن ﴿والله بكل شئ عليم﴾ دیارە خواش بەهەموو شتێك زانایە، ئەو خۆی چاك دەزانێ کێ لە میراتەکە چەندە بەشی بدرێت، جابۆ پتر ئاگادار بوون لە وردەکاریەکانی مەسەلەی میرات، دەتوانی بگەڕێیتەوە بۆئایەتی (١١،١٢)ی سوورەتی (ژنان) ئەگەرچی ڕەخنەگران و (عەلمانیەکان) لەبەر خۆشەویستییەکی شەهوانیی و کوێرانەی ژنان، خۆیان کەڕو کوێرکردووەو، هەرگیز هەق نابیسن، ئەگینە وادەزانم ئەوەندە لەو بابەتە نووسراوە بۆ

مرۆڤی ژیرو ئاقڵ بەس بێت، سەرەڕای ئەمانەیش، دەبێ بزانن کە هەموو مەسەلەکانی ژنان ، وە میراتیش یەکێکیانە، بەگوێترەو سادە بڕیاریان لەسەر نەدراوە، بەڵکو زۆر وردەکاری تیا بەکارهێنراوە، کە ئەر لەوەکەمتر، یان زیاتر بێت ژیانی ئەودوو مرۆڤە (نێرووەمێیە) تێك دەچێ و لارەسەنگ دەبێ و، ژنانیش "بۆخۆیان" هاواریان لێ بەرز دەبێتەوە، بۆنموونە: (نەفەقە)ی ژنان لەسەر باوك و براو کەس و کارو مێردە، دیارە ئێستا ئەو ژنانە کە لەدەزگایەکدا کارمەندن وهاوکاری باش دەکرێن، قبووڵیان نییەو بەسووکایەتی ژنانی دەزانن ودەڵێن: ژنان دەبێ بۆخۆیان بژێوی پەیدا بکەن! وادەزانم ئەو خانمانە کە ئەو قسەیە دەکەن، هەر ئەوکاتەیە رازی دەبن بژێویان لەسەرخۆیان بێت لەجێگایەك کارمەندبن، چونکە ئەگەر ببنە کشتیارو کرێکار، کوڵکێشی وپاچەکوڵەو شوانی پێبکەن، ئەوا لەباتی جارێك هەزارجار هاواریان لێ بەرز دەبێتەوەو داوادەکەن کە: ژنان خانمی ماڵ بن و نان و نەفەقەیان لەسەر پیاوان بێ و نەچنە بەر سەرمای زستان و، گەرمای گەرمی هاوین، جامن نامەوێ لەم جێگایەدا زیاتر بچم، وەکو گوتم کتێبی زۆری لەسەر نووسراوە، باخانمەکان و، ئەوانەی گریەیان بۆدەکەن خۆیان بچن بەویژدانەوە دیراسەیەکیان بکەن.

زۆر زۆرسوپاس بۆخوای بالادەس کەپشتیوانی لێکردم بۆتەواوکردنی ئەم کورتە تەفسیرە بۆ سوورەتی (نیساء).

*** *** ***

## ٥- سوورەتی ( مائیدە )ـە
## مەدەنییەو ( ١٢٠ ) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتی (مائیدە)یەش وەك سوورەتە هاوڕێکانی خۆی: (بەقەرە، نیساء، ئەنفال) گرنگییەکی زۆر دەدات بەیاساو داڕشتنی بەرنامە بۆرووداوەکان، لەپاڵ تیشك خستنەسەر بیروباوەڕی خاوەننامەکان. ئەم سوورەتە سڕاوەو (مەنسووخ)ی تێدانییەو، (١٨) بڕیاری فەرزو واجبیاتی خوایی تێدایە. ئەم سوورەتە لەکاتی گەڕانەوەی پەیامبەر ﷺ لە(حودەیبیە)دا هاتەخوارەوە، سەرجەم باسی حوکمە شەرعییەکان دەکات، ئەوەش لەبەر ئەوەیە کەهێشتا دەوڵەتی ئیسلامیی لەسەرەتای پێگەیشتنیدا بوو، دیارە تا دادەمەزرێ و لەهەڵەو پەڵە دوور دەبێ، پێویستی بەگەلێ یاساو ڕێنمایی ئاوای خوایی هەیە. ئەمەیش کورتەیەکی ئەوحوکمانەیە کە ئەم سوورەتە لێیان دەدوێ: ڕێکەوتن و پەیمان بەستن، شێوەی حەیوان سەربڕین، نێچیر راوکردن، ئیحرام بەستن بەحەج، یا بە عەمرە، مارەکردنی ژنانی خاوەن نامەو کتێب، پاشگەز بوونەوە لەئیسلام، نوێژو دەست نوێژ، یاسای دەست بڕینی دز، یاسای تۆڵەی ڕێگرو (ئیفساد) کارو عارەق خۆرو قومارباز، کەفارەتی سوێن شکاندن، نێچیر کوشتن بەبەرگی ئیحرامەوە، وەسیەتکردن پێش مردن.. هتد. سەرەڕای ئەمانەیش هەندێ داستان و چیرۆك دەگێڕێتەوە بۆپەندو

الجزء السادس — سورة المائدة

يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الْكَلَالَةِ إِنِ امْرُؤٌا هَلَكَ
لَيْسَ لَهُ وَلَدٌ وَلَهُ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ وَهُوَ يَرِثُهَا
إِن لَّمْ يَكُن لَّهَا وَلَدٌ فَإِن كَانَتَا اثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا الثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ
وَإِن كَانُوا إِخْوَةً رِّجَالًا وَنِسَاءً فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنثَيَيْنِ
يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ أَن تَضِلُّوا وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴿١٧٦﴾

سُورَةُ الْمَائِدَةِ

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَوْفُوا بِالْعُقُودِ أُحِلَّتْ لَكُم بَهِيمَةُ
الْأَنْعَامِ إِلَّا مَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ غَيْرَ مُحِلِّي الصَّيْدِ وَأَنتُمْ حُرُمٌ إِنَّ اللَّهَ
يَحْكُمُ مَا يُرِيدُ ﴿١﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُحِلُّوا شَعَائِرَ اللَّهِ
وَلَا الشَّهْرَ الْحَرَامَ وَلَا الْهَدْيَ وَلَا الْقَلَائِدَ وَلَا آمِّينَ الْبَيْتَ
الْحَرَامَ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّن رَّبِّهِمْ وَرِضْوَانًا وَإِذَا حَلَلْتُمْ فَاصْطَادُوا
وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ أَن صَدُّوكُمْ عَنِ الْمَسْجِدِ
الْحَرَامِ أَن تَعْتَدُوا وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَىٰ وَلَا تَعَاوَنُوا
عَلَى الْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ ﴿٢﴾

حرمت عليكم ١٠٦

ئامۆژگاریی، بۆنموونە: چیرۆکی (بەنی ئیسرائیل) لەگەڵ مووسادا ﷺ کە هێمایە بۆگشت یاخیبوون و سەرکێشی و لەسنوور دەرچوونێك و تۆڵەکەشی. پاشان داستانی هەردوو کوڕەکەی بابە گەورەمان ئادەم ﷺ، کەهێمای ململانێی ئەهلی خێرو شەڕە تادواڕۆژی دوایی.. ئینجا باسی عەقیدە هەڵوەشاوەکەی جوولەکەو گاوران و پەیمان شکێنیان دەکات، کەچۆن هەموو وەخت پەیمانیان دەبەست و دەیانشکاندو (تەورات) و (ئینجیل)یان دەگۆڕی و بڕوایشیان بە پەیامەکەی پێغەمبەر ﷺ نەدەهێنا.

بەهێنانی دیمەنێکی ترسناك و ترسێنەری ڕۆژی دوایی کۆتایی دێت، بەتایبەتی دیمەنێك لەگەڵ عیسای کوڕی مەریەم دا ﷺ ئەوکاتە کە خوای گەورە پرسیاری لێدەکاو دەفەرموێ: (أانت قلت للناس اتخذونی وأمی الهین من دون الله) ئەهای ئەو ڕۆژە، چ ڕۆژێکی قورس و سەخت و دژوارە!.

**بەڵێنتان جێبەجێ بکەن :**

﴿بسم الله الرحمن الرحیم * [1] یاأیهاالذین آمنوا أوفوا بالعقود﴾ ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! گشت پەیمانێك جێبەجێ بکەن و، لەئەنجامدانیا بەئەمەك و بەوەفابن. بەڵێ.. هەرچی خوا فەرمانی بەکردنی دابێ، وەیان ڕێی بەکردنی نەدابێ، وەکو پەیمان تەماشا دەکرێ و، دەبێ وەفای پێ بکرێت. پیاوێك بە (عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود)ی گوت: وەسیەتێکم بۆبکە! ئەویش گوتی: هەرکە لەقورئاندا گوێت لە (یاایهاالذین آمنوا)وە بوو، دەبێ چاك وەری بگریت، چونکە حەتمەن، یان بڕیاری چاکەیە، وەیان ڕێگرتنە لەخراپە. (خەیسەمە) دەڵێ: لەجێی هەموو (یاأیهاالذین..)ەکانی قورئان، لە تەوراتدا (یاأیهاالمساکین) بووە.

**ئاژەڵی حەرام و، حەلاڵ :**

خوای گەورەو میهرەبان لەم ئایەتانەدا ماڵات ووڵاتی حەلاڵ و حەراممان بۆ ڕوون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿احلت لکم بهیمة الأنعام﴾ خواردنی گۆشتی وشترو گاو مەڕو بزن -دوای سەربڕینیان- حەلاڵکراوە بۆتان، هەروەها بەچکەی هەرکامێکیشان، ئەر دوای سەربڕینی لەناوسکیا گیانی تێدا نەمابێ، وەکوپێغەمبەر دەفەرموێ: ((كُلُوهُ إِنْ شِئْتُمْ، فإن ذكاتَهُ ذَكَاةُ أُمِّه)). ئەبووداود، ترمزیی. ﴿إلا ما یتلی علیکم﴾ ئەوپەلەوەرو ئاژەڵە نەبێ کە: لەم سوورەتەدا هەرئێستا بۆتان دەخوێنرێتەوە لەئایەتی: (حرمت علیکم المیتة) دا. ﴿غیر محلی الصید وانتم حرم﴾ بەلأم تا لە ئیحرامدان، ڕاوکردن بەڕەوا دامەنێن، واتە: لەبەرگی ئیحرامدا ڕاوکردنی نێچیری حەیوانی وشکایی - ئەگەرچی گۆشتیشی بخورێ- حەرام و یاساغە، دیارە ئەمانە بڕیارو سنووری خوای گەورەن و، دەبێ ئاگاداربن ﴿إن الله یحکم ما یرید﴾ بەڕاستیی خواش هەرچۆنێکی ویست، بڕیاردەدات، چونکە ئەو چاکتر دەزانێ چی حەلاڵ بکاو، چیش حەرام بکات, واتە: (بەحیرە، و سائیبەو، وەصیلە و، حام)- کە دواتر باسیاندێ- و عەرەبەکان لەخۆیانیان حەرامکردبوون، بەقسەی ئەوان حەرام نابن، چونکە خوا حەلاڵی کردون، دیاریشە بڕیاری وا، کەس بۆی نییە هەڵیوەشێنێتەوە.

**دەسکاری دروشمەکانی خوا مەکەن :**

﴿[2] یاأیهاالذین آمنوا لاتحلوا شعائرالله﴾ ئەی ئەوکەسانەی بڕواتان هێناوە! (ئەمر) و (نەهی) و دروشمەکانی خوا -بەتایبەتی دروشمەکانی حەج وعەمرە -دەسکاری مەکەن و، پشتگوێیان مەخەن ﴿ولا الشهر الحرام و لا الهدی ولا القلائد﴾ وە لەمانگە قەدەغەکراوەکانیشدا، شەڕ ڕەوا مەکەن و، هەر حەیوانێکیش ناوی قوربانی و (هەدیی) لەسەربێت بۆماڵی خوا، مەرجەکانی مەشێوێنن و دەستی بۆمەبەن و، هەر ئاژەڵێکیش دیارییکرابێ و

نیشانەی لەملکرابێ بەمەستی کردنی بەقوربانیی، نیشانەکەی لێمەکەنەوەو لەناوی مەبەن. بەڵێ..ئەر حەیوانێکیان بۆخوا نەزر کردبا، دەهاتن شتێکیان لەمل دەکرد، تابیێتە بەڵگەی نەزرکردنی بۆخواو، کەسیش نەتوانێ دەستی بۆبیا، قورئان هات کەئەوکارەیان ئەنجام بدەن و، فێڵ و فەرەجی تێدانەکەن ﴿ولا آمين البيت الحرام﴾ وە لەوانە رێ مەگرن، کە بەنیازن تەواف و زیارەتی (کابە) بکەن ﴿يبتغون فضلا من ربهم ورضوانا﴾ و بەئومێدی فەزڵ و رۆزی خۆشنوودی و پەروەردگاریان دەس بخەن ﴿و إذا حللتم فاصطادوا﴾ جاهەر کەخۆتان حەلاڵکردەوە، واتە: ئیحرامتان شکاندو، حەرەمتان جێهێشت، راوو نێچیر گرتنتان بۆ رەوایەو، دەتوانن راو بکەن ﴿ولا يجرمنكم شنآن قوم أن صدوكم عن المسجد الحرام﴾ هەرگیز رکی کۆنی ئەوانە کە: لە (حودەیبیە)دا رێیان لێگرتن لەزیارەتی مزگەوتی حەرام، هەڵتان نەنێت ﴿أن تعتدوا﴾ کەئێستا ئێوەش دەستیان پێبگەیەنن و تۆڵەیان لێبکەنەوە ﴿وتعاونوا على البر والتقوى﴾ لەسەر چاکەو هاوکاریو کۆمەکو پارێزگاریی، یارمەتی یەکتربدەن، لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: (ولا يجرمنكم شنآن قوم على أن لا تعدلوا إعدلوا هو أقرب للتقوى..) ﴿ولا تعاونوا على الإثم و العدوان﴾ بەلاّم بۆ گوناح و تاوان و دەستدرێژی و، لەسنوور دەرچوون، هاوکاریی وکۆمەکی یەکتر مەکەن، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: ((أُنْصُرْ أَخَاكَ ظَالِمًا أو مَظْلُومًا)) واتە: هاوکاری و یارمەتی براکەت بدە، ستەمکار بێ، یان ستەمڵێکراو، جاهاوەڵان لەو قسەیە سەرسام بوون! بۆیە گوتیان: بەڵێ ستەم لێکراوەکە راستەو جێی خۆیەتی هاوکاری بکەین، بەلاّم ئەی چۆن یارمەتی ستەمکارە کەبدرێت ؟! ئەویش فەرمووی: دەستی بگرەو مەهێڵە ستەم بکات، ئەوە دەبێتە یارمەتی بۆی. پێشەوا ئەحمەد. ﴿واتقوا الله إن الله شديد العقاب﴾ دەبێ لەسزای خوا بترسن، چونکە بەراستیی خوا بەرامبەر بە نافەرمان، خاوەن تۆڵەیەکی زۆر بەهێزو توندە.

رێنمایەکانی ئایەتی (١-٢):

١- پەیمانی خوا لەگەڵ بەندەکانیو، پەیمانی مرۆڤەکان لەگەڵ خۆیاندا بپارێزن.

٢- گۆشتی مەڕومالاّتی مردارەوە نەبوو حەلاّڵە.

٣- راوی نیچیری وشکایی -وەك نێچیری دەریایی- بۆ حاجیان وعومرەکەران لەبەرگی ئیحرامدا حەرامە.

٤- ریزگرتن لە (شەعائیر)و دروشمە دینیەکانی خوا پێویستە.

٥- دەستدرێژی تەنانەتی بۆسەر کافرانیش کارێکی حەرامە.

٦- پێویستە موسڵمانان هەمیشە لەسەر جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خوا، یارمەتی و هاوکاری یەکتر بکەن و، بەصەبرو بە ئارامیش بن، ئەم فەرموودەی پێغەمبەرەش هەر لەوبارەوە هاتووەو دەفەرموێ: ((المُؤْمِنُ الّذِي يُخَالِطُ الناسَ ويَصْبِرُ على اذاهم، أَعْظَمُ أجراً من الذى لايُخَالِطُ الناسَ ولا يَصْبِرُ عَلَى أَذَاهُمْ)) پێشەوا ئەحمەد.

**وریابن! خواردنی ئەم شتانە حەرامە :**

﴿٣ حرمت عليكم الميتة والدم ولحم الخنزير﴾ خواردنی گۆشتی مردارەوە بووو، هەرخوێنێ لەهەر ئەندامێکی حەیوان بێتە دەرێ و بڕوا، حەرامە بۆتان ئەی موسڵمانان! بەلاّم خوێنی گیرساوو نەچوو، وەك خوێنی جگەر، سپڵ، حەلاّڵە، هەروەها ماسیی و کوللەش بێ سەربڕینیان حەلاّڵن و دەخورێن، وەك پێغەمبەر دەفەرموێ: (أُحلَّ لنا مَيْتَتَانِ وَ دَمانِ، فَأَما المَيْتَتان فالسَمَكُ والجَرادُ، وأما الدَمانِ: فالكَبِدُ والطِحالُ) مەسنەدی شافیعیی. هەروەها گۆشتی بەرازیش پیسەو لەسەرتان یاساغکراوە ﴿وما أهل لغيرالله به﴾ و هەر ئاژەڵێکیش کە لەوەختی سەربڕیندا ناوی غەیری خوای لێ بهێنرێ ﴿والمنخنقة﴾ و مالاّتی خنکاوو ﴿والموقوذة﴾ و لێدراویی مردارەوە بوو ﴿والمتردية﴾ و

هەڵدێراوو لەشاخ بەرەوەبوو ﴿والنطیحة﴾ و مردارەوە بوو لەشەڕە قۆچدا ﴿وما اکل السبع﴾ وهەرچی دڕندە پەلاماری دابێ و مردارەوە بووبێ ﴿إلا ما ذکیتم﴾ مەگەر بەر لەگیان دەرچوونی، فریای چەقۆ کەوتبێ و سەرتان بڕیبێ، واتە: ئەگەر هەریەك لەوانە پێش گیاندەرچوونی بەردەسکەوت و سەربڕا، خواردنی حەلاڵ دەبێ ﴿وما ذبح علی النصب﴾ وە هەرچی بۆ بتەکانیش سەربڕا حەرامە ﴿وان تستقسموا بالأزلام﴾ و هەرچیش لەسەر قوماری تیر دابەش دەکرێ و، مەبەستەکانی پێ دیاری دەکرێ، قەدەغەو حەرامە. (ئەزلام) بریتی بووە لەسێ (قەدەح) هەریەکەیان یەکێ لەم دەستەواژەیان لەسەر نووسی بوو: (أمَرَنی ربّی، نَهانی ربی، غَفل)، ئەگەر کەسێك ویستبای هەر کارێ بکات، دەچوو شتێکی هەڵدەدا بۆسەر یەکێکیان، پاشان هەرکامێکیانی بۆ دەرچووبا، دەچوو بەپێی ئەوەیان کاری دەکرد! ئەوسا کەدینی ئیسلامی پیرۆز هات، ئەو کارەی هەڵوەشاندەوەو لەجێی ئەودا، بۆدۆزینەوەی هەرکارێکی راست و خێروچاك (صلاة الإستخارة)ی دانا، هیوادارم پەیڕەویی لەمە بکرێت، پێشەوا (ئەحمەد) بۆ شەرعییەت و شێوەی (ئیستیخارە)، ئەم فەرموودەیە دێنێ ودەفەرموێ: ((إذا هَمَّ احدُکُمْ بالأمر فَلْیَرْکَعْ رکعتَیْنِ مِنْ غَیْرِ الفریضة، ثم لْیَقُلْ: اللّهُمّ إنی أسْتَخِیرُكَ بِعِلْمِكَ، وأسْتَقْدِرُكَ بِقُدْرَتِكَ، واسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ العَظِیم، فإنك تَقْدِرُ ولاأقْدِر..)) هەتا کۆتایی فەرموودەکە. ﴿ذلکم فسق﴾ کردنی هەرکارێ لەوانە، لەسنوور دەرچوون و نافەرمانی خوایەو، تۆڵە دەدرێ ﴿الیوم یئس الذین کفروا من دینکم﴾ ئیتر وا (ئەمرۆ) ڕۆژی عەرەفەیە ئەوانەی کەکافرو بێ باوەڕن، لەگەیاندنی زیان بە دینەکەتان، واتە: بێ ئومێدو بێ هیواو تەماح بڕ بوون لەوە کە ئێوە لەئایینەکەتان وازبێنن و بگەڕێنەوە سەردین و ئایینی ئەوان، دەشزانن کە ئیتر هەرگیز زاڵ نابن بەسەرتانا، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((إن الشیْطانَ قد یَئِسَ أن یَعْبُدَهُ المُصَلّونَ فی جَزِیرَةِ العرب، ولکنَ بالتَّحْرِیشِ بَیْنَهُمْ)) موسلیم/ ٢١٦٦. ﴿فلا تخشوهم واخشون﴾ کەوابوو لەوان مەترسن، وهەر لە من بترسن و پاریزگاری لەسنوورەکانی من بکەن ﴿الیوم اکملت لکم دینکم﴾ وا لەئەمرۆوە بەرنامەو ئایینەکەتانم بەپایان گەیاند، واتە: لەبارەی ئاقیدەو جیهادەوە، لەبارەی حەلاڵ وحەرامەوە، هەمووشتێکم بۆ تەواوکردن ﴿واتممت علیکم نعمتی﴾ وە نیعمەت و بەخششی خۆمم بۆ تەواوکردن سەرم خستن بەسەر دوژمنانتاناو ڕێنماییم کردن بۆرێگەی راست، ئیتر نەپێویست بە پێغەمبەرێ تر هەیەو، نەقورئانێکی دیکە ﴿ورضیت لکم الإسلام دینا﴾ ئیسلامیشم بەبەرنامەو ئایین بۆ هەڵبژاردن و، نابێ هیچ کاتێك لێی لابدەن و خۆکلا بکەن ﴿فمن اضطر فی مخمصة﴾ ئینجا لەگەڵ حەرامکردنی ئەوشتانەشدا، هەرکەسێك لەبرسانا ناچار بوو بۆ خواردنی هەریەکێ لە قەدەغەکراوەکان و، مەترسی ئەوەی هەبوو گەر شتێ نەخوا لەبرسا بمرێ، دەتوانێ لێیان بخوات ﴿غیر متجانف لإثم﴾ بەمەرجێ نەیەوێ خۆی تووشی گوناح

الجزء السادس — سورة المائدة

حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةُ وَٱلدَّمُ وَلَحْمُ ٱلْخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ لِغَيْرِ ٱللَّهِ
بِهِۦ وَٱلْمُنْخَنِقَةُ وَٱلْمَوْقُوذَةُ وَٱلْمُتَرَدِّيَةُ وَٱلنَّطِيحَةُ وَمَآ أَكَلَ
ٱلسَّبُعُ إِلَّا مَا ذَكَّيْتُمْ وَمَا ذُبِحَ عَلَى ٱلنُّصُبِ وَأَن تَسْتَقْسِمُوا۟
بِٱلْأَزْلَٰمِ ذَٰلِكُمْ فِسْقٌ ٱلْيَوْمَ يَئِسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن دِينِكُمْ
فَلَا تَخْشَوْهُمْ وَٱخْشَوْنِ ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ
عَلَيْكُمْ نِعْمَتِى وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا فَمَنِ ٱضْطُرَّ فِى
مَخْمَصَةٍ غَيْرَ مُتَجَانِفٍ لِّإِثْمٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ٣
يَسْـَٔلُونَكَ مَاذَآ أُحِلَّ لَهُمْ قُلْ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُ وَمَا عَلَّمْتُم
مِّنَ ٱلْجَوَارِحِ مُكَلِّبِينَ تُعَلِّمُونَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَكُمُ ٱللَّهُ فَكُلُوا۟ مِمَّآ أَمْسَكْنَ
عَلَيْكُمْ وَٱذْكُرُوا۟ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَيْهِ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ
٤ ٱلْيَوْمَ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُ وَطَعَامُ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ حِلٌّ
لَّكُمْ وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَّهُمْ وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ وَٱلْمُحْصَنَٰتُ
مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ إِذَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ
مُحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَٰفِحِينَ وَلَا مُتَّخِذِىٓ أَخْدَانٍ وَمَن يَكْفُرْ
بِٱلْإِيمَٰنِ فَقَدْ حَبِطَ عَمَلُهُۥ وَهُوَ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ٥

١٠٧

بکاو، زێدەڕەوی بکات ﴿فإن الله غفور رحيم﴾ بەراستیی خوایش زۆر لێبوردەیە، ئەگەر لەکاتی وادا شتیٚ بخوا لێی ناگریٚ، زۆریش بەمیهرەبان و دلۆڤانە، ئەوەتا لەکاتی تەنگانەدا شتی یاساغکراوتان بۆ حەڵاڵدەکات، ئەمەیش فەرموودەی پێغەمبەرەﷺ کەلەو بارەوە دەفەرمویٚ: ((إن الله يُحِبُ انْ تُؤتَى رُخصَهُ، كَما يَكْرَهُ انْ تُؤتَى مَعْصِيَتُهُ)) ئیبن حیببان.

رێنمایەکانی ئایەتی (٣):

١- گۆشتی بەرازو هەمووشتێکی مردارەبوو حەرامە.

٢- هەرشتێکیش کەسەرەنجامەکەی بە (تیر/ ئەزلام) دەربکەویٚ (وەك أمرنی ربی، نهانی ربی..) قەدەغەیە بەکار هێنانی.

٣- هەرحەیوانێك لەبەرامبەر گۆڕی هەر پێغەمبەرو پیاوچاکێکەوە، یان لەبەر پێی هەر سەرۆك وپاشایەکەوە، سەر بڕا حەرامە. هەر حەیوانیٚ لەحاڵی ژیاندا سەر بڕا، ئەگەرچی لەگیانەڵانیشدا بێت حەڵاڵە. دەبیٚ تەنها لەخوا ترسمان هەبیٚ.

٤- داهێنانی هەرکارێکی بیدعە لەدیندا حەرامە.

٥- مرۆڤی برسی و ناچار -بەمەرجیٚ مەبەستی بەزاندنی سنوورەکانی خوا نەبیٚ- دەتوانیٚ لەگۆشتی مردارەوەبوو بخوا.

٦- هەر ئامێرێکی تیژ بڕ -بەدەر لەئێسك وددان- حەیوانی پیٚ سەردەبڕدریٚ، بەو مەرجە کە رەگ و دەمارەکانی لاملی ببڕدریٚ و، لەکاتی سەربڕینیدا خوێنیش دەرپەڕیٚ.

٧- نەرم ونیانیی و میهرەبانی لەگەڵ حەیوانەکەدا "بەر لەسەر بڕینی" کارێکی سوننەتە.

٨- دەبیٚ ئامێری سەربڕین تیژبیٚ، حەیوانەکە ڕووی لەڕووگە بکریٚ و، هەتا بەتەواوی پاش سەربڕین سارد نەبێتەوە، چەرمەکەی لیٚ نەکرێتەوە. پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویٚ:((إنَ الله كَتَبَ الإحْسَانَ على كُلِّ شَيءٍ ، فإذا قَتَلْتُمْ فَأَحْسِنُوا القِتْلَةَ ، وإذا ذَبَحْتُمْ فَأَحْسِنُوا الذِّبْحَةَ، وَلْيُحِدَّ أَحَدُكُمْ شَفْرَتَهُ، وَلِيُرِحْ ذَبِيحَتَهُ)) موسلیم. ئەم فەرموودە هەموو ئەوشتانەی لەخۆگرتووە باسمانکردن، واتاکەیشی ئەوەیە کە: بیٚ سۆ خوای دلۆڤان لەسەرتانی نووسیوە کەدەبیٚ بەرامبەر بە هەمووشتێك، چاك رەفتار بن، جاهەرکە ویستان کەسیٚ بە حەقی شەرعیی بکوژنەوە، دەبیٚ بەشێوەیەکی چاك و باش وشەرعیی بیکوژنەوە، هەرکاتێکیش دەتانەویٚ (ماڵات و باڵندیەك) سەر بڕن، دەبیٚ بەئاسانی سەری بڕن و، یاسای شەریعەت رەچاوکەن و، چەقۆکەتان تیژ بکەن و، ئیسراحەت بە سەربڕاوەکە بدەن.

**هەرچی جانەوەری ڕاو، بیگریٚ حەڵاڵە :**

﴿٤ يسألونك ماذا أحل لهم﴾ لێت دەپرسن: چی حەڵاڵ و رەوایە بۆیان ﴿قل احل لكم الطيبات﴾ پێیان بڵیٚ: هەموو خۆراکە چاك و پاکەکانتان بۆحەڵاڵە، مەبەست لەوشتانەیەکە قورئان و فەرمووده، یان بەکۆی زانایان، یان بەقیاس، لەحەرامەکان جیاکراونەتەوە ﴿وما علمتم من الجوارح﴾ و ئەوەش کەباڵندەو تاژی شکاریی بۆتانی ڕاودەکەن و، بەباشی فێری ڕاوتان کردبن و نێچیرتان بۆبگرن ﴿مكلبين﴾ و ڕاتان هێنابن و تالیمتان کردبن بۆ ڕاو ﴿تعلمونهن مما علمكم الله﴾ و شێوەی ڕاوکردنتان فێر کردبن، وەك خوا ئێوەی فێرکردووە، هەرشتیٚ ئاوا هاتە بەردەستتان حەڵاڵە بیخۆن، پێغەمبەریش لەبارەی (باز)ەوە فەرمووی: ((ماأمْسَكَ عليكَ فَكُلْ)) تەبەریی. ﴿فكلوا مما امسكن عليكم﴾ دەسا بخۆن لەو نێچیرەی کەئەوانە بۆتان دەگرن و، خۆیان لێی ناخۆن ﴿واذكروا اسم الله عليه﴾

بەڵام کاتێ بەرەڵای دەکەن ناوی خوای لێ بێنن، و بڵێن: (بسم الله). (بوخاریی وموسلیم) -خوا لێیان رازیی بێت- دەڵێن: پەیامبەر فەرموویەتی: ((إذا أَرْسَلْتَ كَلْبَكَ الْمُعَلَّمَ، وذكرتَ اسمَ اللهِ عليه فَكُلْ مِمَّا أَمْسَكَ عليك، وإن أدركتَه وقد قَتَل وأَكَلَ مِنْهُ، فلا تَأْكُلْ مِنْهُ شيئا فإنما أَمْسَكَ على نَفْسِهِ)). واتە: هەرکات سەگی راوت هاندایە گیانی هەرماڵات و پەلەوەرێك، ناوی خوای لێ بێنە، ئیتر هەرشتێکی بۆگرتی و، خۆی لێی نەخوارد تۆ لێی بخۆ، خۆئەگەر گرتیی و لێی خوارد، لێی نەخۆیت. بەڵێ راوو نێچیر گرتن بەشێکی زۆر گرنگی باری ئابووریی و ژیانە، دیارە گەڵێ کەسیش دڵی پێوەی بەسراوەو حەزی لێدەکات، جا بۆیە ئیسلامیش ئەوجۆرە حەزلێکردنو داخوازیانە دەنرخێنێ و یاسای بۆدیاریی دەکات، پەیامبەریش ﷺ دەفەرموێ: هەرکات سەگی تالیم کراو مەشق دیوت هانداو ناوی خوات لێ هێناو رۆیشت بۆ نێچیرەکەو دەستی گەیاندێ و، گرتی و کوشتی، بەئارەزووی خۆت لێی بخۆو حەڵاڵە، بەڵام ئەگەر گرتیی ولێی خوارد، نابێ تۆیش لێی بخۆیت، چونکە بۆخۆیی گرتووە، جا نیشانەی سەگی مەشق پێکراوو تالیم دراو (راهێنراو) بەم شێوەیە:

١- هەرکاتێ هانتداو بەرەڵڵات کرد لەهەر نێچیرێ، دەبێ دەست بەجێ بەگوێت بکاو بچێت.

٢- هەرکات پێتگوت: نەچیت، دەبێ خێرا بوەستێ ونەچێت.

٣- هەرکات گیاندارو باڵندەیەکی گرت، نابێ لێی بخوات.

بەڵی بەم مەرجانەی سەرەوە سەگی تالیمدراو، یان باز، یاشاهین، یان هەڵۆ.. هتد هەرچی بگرن ئەگەرچی گیانیشیان تیانەمێنێ و بمرێ گۆشتەکەی دەخورێ، وخۆی بەچەقۆ حساب دەکرێ ﴿واتقوالله إن الله سريع الحساب﴾ و لەخوا خۆبپارێزن و لەسزای بترسن، چونکە بەراستیی خوا بەچەسپانیی حیسابتان لەگەڵ دەکات.

**خواردەمەنی ئەهلی کتێب و نیکاحی ژنانیان حەلاڵە :**

﴿ ٥ اليوم أحل لكم الطيبات﴾ لەئەمڕۆ بەدواوە هەمووشتێکی چاك و پاکتان بۆرەوایە ﴿وطعام الذين أوتوا الكتاب حل لكم﴾ و سەربڕاوی دەستی ئەوانەی نامەیان پێدراوە رەوایە بۆتان و دەتوانن بیخۆن ﴿وطعامكم حل لهم﴾ وە خواردن و سەربڕاوی دەستی ئێوەیش بۆئەوان حەڵاڵەو رێی پێدراوە، واتە: ئەگەر ئێوە بەمەبەستی نزیکبوونەوەی موسڵمانان و خاوەننامەکان لەیەکدیی، شتیان بدەنێ گوناهتان ناگات، سا بەڵکو لەئایینی پیرۆزی ئیسلام تێبگەن. بەڵێ..خوا لەبەردی بناغەی خێزاندا رێگای کردۆتەوە بۆ ژن و، ژن خواستن و خواردنی گۆشتی دەستی خاوەننامەکان، واتە: رێگە بەموسڵمانان دراوە کە لەئەهلی کتێب ژن بێنن و، لەحەیوانی سەربڕاوی دەستیان و خواردنیان بخۆن، بەڵام ئەوکەسانەی کەلە زنجیرەی یەکتاپەرستیی دەرچووبن - وەك ئاگرپەرست و پاشگەزبووەکان لەئیسلام- بەهیچ شێوەیەك رێگا نییە ژنیان لێ بێنین و، لەگۆشتی حەیوانی سەربڕاویشیان بخۆین ﴿والمحصنات من المؤمنات والمحصنات من الذين أوتوا الكتاب من قبلكم﴾ و ژنانی ئیماندارو داوێنپاك و (حوڕ) و ئازادیشتان بۆحەڵاڵە، هەروەها ئەو ژنەداوێنپاکانەش کە لەپێش ئێوە کتێب و نامەیان پێدراوە (لەو جوولەکە و گاورانە) بڕوایان بەتەورات و ئینجیل هەیە ﴿إذا آتيتموهن أجورهن﴾ بەمەرجێ مارەییەکانیان بدەنێ ﴿محصنين غير مسافحين﴾ و ئێوەش وەکو ئەوان داوێنپاك بن، و شەروال پیس و زیناکار نەبن ﴿ولا متتخذي أخدان﴾ و دۆستی مێینەی ژێربەژێریشتان بۆ کاری داوێن پیسی نەبێ، وەکو لەئایەتێکی تردا لەپەسنیاندا دەفەرموێ: (محصنات غير مسافحات ولا متخذات أخدان) ئەگەرچی (عەبدوالله کوڕی عومەر) رێی نەدەدا ژنی نەصرانی مارە بکرێت، چونکە دەیگوت: دەڵێن عیسا کوڕی خوایە !جا چ شیرکێك لەوە گەورەترە، کە قورئانیش دەفەرموێ: (ولا تنكحوا المشركات

حتى يؤمن) ﴿ومن يكفر بالإيمان فقد حبط عمله﴾ بێگومان هەرکەس بڕوای بەبەرنامەی ئیسلام نەبێ و پاشگەز بوویەوە، ئەوە بەراستیی هەمووکاروکردەوە چاکەکانیشی پووچەڵ دەبنەوە ﴿وهو في الآخرة من الخاسرين﴾ و لەدوارۆژیشدا یەکێکە لەریزی زیانمەنداندان. بەڵێ بەپێی ئەم ئایەتە مرۆڤی (مورتەد)و لەدین وەرگەڕاوە هەر کردەوەیەکی چاکیشی هەبێ باتڵ وپووچەڵ دەبێتەوە، بەڵام لەجێی تردا ئاماژە دەکات کە: کاتێ کردەوەکانی پووچەڵ دەبنەوە کە ئەوکەسە بەبێ باوەڕیی و کافریی سەر بنێتەوەو بمرێ، وەك لەسوورەتی (بەقەرە: ٢١٧)یشدا هاتووەو دەفەرموێ: (وَمَنْ يَرْتَدِدْ مِنْكُمْ عَنْ دِينِهِ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ ..).

رێنمایەکانی ئایەتی (٤،٥):

١- دەبێ بۆ گشت کاروباری ژیانت، بەتایبەتی دەربارەی حەڵاڵ وحەرام لەزانایەکی شەرعزان بپرسی.

٢- گۆشتی نیچیر بەم مەرجانەی خوارەوە حەڵاڵە :

یەکەم: راوپێکراوەکە تالیمکراوبێ. دووەم: ئەوکاتە بەرەڵا دەکرێ و دەنێردرێ بۆنێچیرەکە (بسم الله)ی بکرێ. سێ یەم: کاتێ نێچیرەکەی گرت، لێی بخوا. چوارەم: ئەوکاتە دەنێردرێ بەنییەتی حەڵاڵکردنەوە بنێردرێ. پێنجەم: هەر حەیوانێ بەتفەنگ، یان بەهەر ئامێرێکی تری تیژ -نەك بەدار، یان بەبەردی پان.. - گیانی لەدستدا حەڵاڵە.

٣- مارەکردنی ژنە (کیتابیەکان)، بەومەرجە: کە ئازادو داوێنپاکبن و بەشێوەی شەرعیی مارەبکرێن حەڵاڵە.

٤- (نكاح المتعة) لای ئەهلی سوننەت و جەماعەت ناڕەواو حەرامە.

٥- زۆرجار نافەرمانیی و کاری تاوان و گوناح، سەردەکێشێ بۆکوفر.

٦- هەموو کاروکردەوەیەکی مرۆڤی لەدین وەرگەڕاوە، باتڵ و پووچەڵە، خۆئەگەر بۆدوایی پەشیمان بوویەوەو هاتەوە لای ئیسلام ، ئەوا کارەکانی پێش (ریددە)کەی هەر لەدەس چووە.

٧- خاتوو(عائیشە) دەڵێ: لەسەفەرێکدا لەگەڵ پەیامبەر ﷺ بووین، هەرکە گەیشتە (ذات الجيش) ملوانکەکەم بچڕاو ونبوو، ئەوجا بەوبۆنەیەوە پەیامبەر ﷺ و هاوەڵان گشت ماتڵ بوون و لەوێ مانەوە، ئاویش دەست نەدەکەوت بۆ نوێژ، ئینجا خەڵکەکە ڕۆشتنە لای (ئەبو بکر)ی بابم و گوتیان: خۆ دیتت (عائیشە) چی کرد بەپەیامبەرو بەوخەڵکە و، وا ئێستاش ئاوییان لانییە؟! جالەوکاتەدا کە پەیامبەر ئیسراحەتی دەکردو سەری لەکۆشمدا بوو وخەوتبوو بابم هات و وتی: عایشە! دەزانی چۆن پەیامبەرو ئەوخەڵکەت ڕاگرتوو ئاویش نییە؟ گلەیی و سەرکۆنەیەکی زۆری کردم و لێم توورە بوو، دەستێکیشی کوتایە کەلەکەم، لەبەر پەیامبەر دڵم نەهات هاوارو جموجۆڵ بکەم، جا کاتێ ڕۆژ بوویەوەو ئاو بۆ دەستنوێژ نەبوو، خوای میهرەبان ئایەتی (تەیەمموم)ی نارد، پاشان (ئوسەید) وتی: ئەی بنەماڵەی ئەبووبکر! ئەمە یەکەم چاکەو پیرۆزیتان نییە بۆموسڵمانان، عائیشە دەڵێ: پاشان سەیر دەکەم ملوانکەکەم لەژێر وشترەکەدایە. (متفق عليه).

باسی دەستنوێژ :

﴿[٦] يا أيها الذين آمنوا إذا قمتم إلى الصلاة﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! هەرکە ویستان هەڵسن بۆ نوێژو دەستنوێژتان نەبوو ﴿فاغسلوا وجوهكم وأيديكم إلى المرافق﴾ دەم و چاوو دەستتان لەگەڵ ئانیشکتاندا بشۆرن ﴿وامسحوا برؤسكم وأرجلكم إلى الكعبين﴾ و مەسحی سەرتان بکێشن و، پێتان لەگەڵ قاپتاندا بشۆرن. بەڵێ.. ئەم وشەی (وأرجلكم) بەسێ جۆر خوێنراوەتەوە: یەکەم و دووەم: کە بەبۆرو سەرە.. (الرفع والنصب) موتەواتیرە. سێیەم: - کە ژێرە (خفض)ە - شازەو لەڕای گشتیی دەرچووە، جا خوێندنەوەی (وأرجلكم) بەسەر، هیچ گرێیەکی

تێدانییەو لەگەڵ مەبەست و ئاقیدەی ئێمەدایە، بەڵام (وأرجلِكم) (بەژێر)ی (لام)ەکە ئاڵۆزییەك دەخوڵقێنێ و، لەگەڵ بیروبۆچوونی ئێمە ناگونجێ، چونکە فەرموودەیەکی زۆرو زەبەندە هەیەو دەچن بەگژ (مەسح) کردنی پێدا لەباتی شۆرین، وەکو دەفەرموێ: ((.. ویل للأعقاب من النار)) و چەند فەرموودەیەکی تریش کە (بوخاریی) و (موسلیم) دەیانهێنن لەجێگەی خۆیاندا، ئیتر جگە لەوەی کە (عوسمان و عەلی و ئیبن عەبباس و موعاویەو عەبدوڵڵای کوڕی زەید) دەڵێن: (أن رسول الله غسل الرجلين فى وضوئه، إما مرة، أو مرتين، أو ثلاثا) بوخاریی. واتە: هەردەم پێغەمبەر ﷺ لەدەستنوێژییدا جاری، یان دووجار، یان سێ جار پێی دەشۆری. بۆ مەسەلەی (خوف)یش: زانایان – شیعەو خەواریج نەبێت – یەکدەنگن بۆ بەکارهێنانی چ لەسەفەردا، چ لەماڵەوە. ئاخۆ شۆرینی پێ لە (مەسح)ی باشتربێ !؟ ئەم وەڵامە کێشەیەکی تێدایە، ئاخۆ ئەگەر خوفەکە دڕابێت (مەسح)ی دەکرێت؟ بۆئەمەش زانایان قسەیان جیاوازە. ماوەی مەسحی خۆی چەندە؟ جەماوەری زانایان دەڵێن: ماوەی مەسحی خوف لە سەفەردا (٣) ڕۆژ و(٣) شەوە، لەماڵەوەیش یەك شەوو یەك ڕۆژە، دەستەیەکیش دەڵێن: (مەسح) بێ ماوەیە. ئاخۆ تەنها (مەسح)ی بەشی سەرەوەی خوف پێویستە، یان بەشی ژێرەوەیشی دەیەوێ ؟ بۆ هەردووڵا ئیختیلاف و ڕای جیا هەیە. ئاخۆ گۆرەویی مەحکەم و ئەستوور (مەسح)ی بەسەرا دەکرێت؟ ئەمیش هەرجێگەی قسەو باسە. ﴿و إن كنتم جنبا فاطهروا﴾ جائەگەر لەش گران بوون، دەبێ تەواوی جەستەو تەنتان بشۆرن و خاوێنی کەنەوە ﴿وإن كنتم مرضى او على سفر﴾ خۆئەگەر نەخۆش و لەش بەبار بوون و، بەکارهێنانی ئاویش زیانی دەبوو بۆتان، وە یان لەسەفەردا بوون ﴿او جاء أحد منكم من الغائط﴾ وە یان یەکێکتان لەجێگای ئەدەبدا بێتەوە ﴿او لامستم النساء﴾ وە یان لەگەڵ ژنانی هاوسەرتان، سەرجێیتان کرد (لەسوورەتی (نیساء)دا سەبارەت بەمانای (لامستم..) کورتە باسێك نووسراوە دەتوانی بگەڕێیتەوە ئەوێ ﴿فلم تجدوا ماء﴾ ئاویشتان دەست نەدەکەوت بۆخۆشتن، یان بۆدەستنوێژ ﴿فتيمموا صعيدا طيبا﴾ ئەوکاتە بە تۆزێکی پاك تەیەموم بکەن ﴿فامسحوا بوجوهكم وأيديكم منه﴾ ڕوومەت و دەستی خۆتانی پێ (مەسح) بکەن : دووجار دەست بە تۆزەکەدا بدەن بۆ هەردووکیان. دەستەیەك لەزانایان دەڵێن: هەمووشتێکی زەویی – گڵ، ڕمڵ، بەرد، کانگە، خوێ .. هتد – ڕەوایە تەیەمومی پێبکرێ. ئەمەیش ڕای (ئیمام مالیك و ئەبوو حەنیفەو سەوریی) و هەندێ لەزانایانی ترە، پێشەوا (شافیعی)یش بۆخۆی دەڵێت: تەیەموم تەنها بەگڵ دەکرێ، بەڵێ.. ئەگەر سەیری ڕۆحی قورئان و ئاسانکاریەکانی ئیسلام بکرێ کەدەفەرموێ: (وماجعل عليكم فى الدين من حرج) زۆر بەئاسانی دەتوانرێ ڕای یەکەم هەڵبژێردرێ.



يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى ٱلْمَرَافِقِ وَٱمْسَحُواْ بِرُءُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى ٱلْكَعْبَيْنِۚ وَإِن كُنتُمْ جُنُبًا فَٱطَّهَّرُواْۚ وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوْ جَآءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ ٱلْغَآئِطِ أَوْ لَٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمْ تَجِدُواْ مَآءً فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدًا طَيِّبًا فَٱمْسَحُواْ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُم مِّنْهُۚ مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُم مِّنْ حَرَجٍ وَلَٰكِن يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمْ وَلِيُتِمَّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٦﴾
وَٱذْكُرُواْ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَمِيثَٰقَهُ ٱلَّذِى وَاثَقَكُم بِهِۦٓ إِذْ قُلْتُمْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَاۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٧﴾
يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ لِلَّهِ شُهَدَآءَ بِٱلْقِسْطِۖ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعْدِلُواْۚ ٱعْدِلُواْ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿٨﴾
وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿٩﴾

**چەند ڕێنمایەك لەبارەی تەیەمومەوە:**

١- تەواوی موسڵمانان یەك دەنگن كە تەیەمموم بۆ بێ دەستنوێژیی بچوك دەكرێ و، بۆ لەشگرانیش هەروا .. زانایەكی (تابعین) نەبێ.

٢- چەندجار دەست لەتۆزەكە بدرێ؟ دەستەیەك دەڵێن: یەكجار بۆدەم و چاوو هەردوودەست بەسە، ئەمەیش ڕای پێشەوا (ئەحمەدو عەتاو مەكحوول و ئەوزاعیی و ئیسحاق)ـە، هەر ئەمڕایەش لەگشت ڕایەكانی تر بەهێزترە، چونكە فەرموودەی (متفق علیه) لەسەرە.

٣- ئایا مەسحی دەست تا ئانیشك پێویستە، یان تەنها هەردوو لەپی دەس؟ بۆ هەردووكیان قسە هەیە، بەڵام پێدەچێ كە تەیەمموم تەنها بۆ هەردوو لەپ بەهێزتر بێ.

٤- ئایا تەرتیب لە ئەندامەكانی تەیەممومدا پێویستە؟ زانایان بۆ ئەمەش ڕای جیاجیایان هەیە.

٥- بەیەك تەیەمموم دوو فەرز یا زیاتر دەكرێ، یان نا؟ هەندێ وەك ئیمامی (ئەحمەدو حەسەنی بەصریی و ئەبوو حەنیفە) دەڵێن: بەڵێ زیاد لە فەرزێكی پێدەكرێ. بەڵام پێشەوا (مالیك و شافیعیی) دەڵێن: تەیەمومێك یەك فەرزی پێدەكرێ.

﴿ما یرید الله لیجعل علیكم من حرج﴾ خوا نایەوێ لە دینداریيدا هیچ جۆرە نارەحەتیەك بخاتە سەرشانتان و سەخڵەتتان بكا ﴿و لكن یرید لیطهركم﴾ بەڵكو ئەیەوێ لەگوناهو تاوان پاكتان بكاتەوە ﴿ولیتم نعمته علیكم﴾ و بە تەواوی بەخششی خۆی بەسەرتانا بڕێژێ ﴿لعلكم تشكرون﴾ بەڵكو سوپاسی چاكەو بەهرەكانی بكەن ﴿٧ واذكروا نعمة الله علیكم﴾ ئەوگشت نیعمەت و بەخششانەتان لەبیربێ، كەخوا دەربارەی كردن ﴿ومیثاقه الذی واثقكم به﴾ و ئەو پەیمانەشتان لەبیرنەچێ لەگەڵ خوادا گرێتاندا ﴿إذ قلتم سمعنا واطعنا﴾ ئەو دەمە كە بەیعەتتان بەپێغەمبەرداو گوتتان: بیستمان و گوێڕایەڵ و بەرفەرمانین، مەبەست بە بەیعەتەكانی سەرەتای ئیسلامە كە: چوونە ژێر هەمووجۆرە ئامادەییەك لەگەڵ پێغەمبەردا ﴿واتقوا الله إن الله علیم بذات الصدور﴾ دەسا هەمیشە لەخوا پەرواتان هەبێ و، لێی بترسن و سەرپێچی حوكم وبڕیارەكانی مەكەن، چونكە بەڕاستیی هەرچی لەسنگ و لەدڵەكاندایە ئەو دەیزانێ.

**ڕاست و بێخەوش شایەتی بدەن:**

﴿٨ یاایهاالذین آمنوا كونوا قوامین لله﴾ ئەی گەلی خاوەن باوەڕ! هەمیشەو بەردەوام هەوڵ بدەن كە لەبەرخوا دادگەرو ڕاست و، پابەندی گشت بڕیارو فەرمانەكانی بن ﴿شهداء بالقسط﴾ بە دادگەرانە شایەتی بدەن و، بەلای هیچ لایەكدا مەبڕن، تەنانەتی منداڵەكانیشتان. (نوعمانی كوڕی بەشیر) دەڵێ: باوكم هەدیەو بەخششێكی دامێ، پاشان دایكم (عەمرەی كچی ڕەواحە) گوتی: هەتا پێغەمبەری خوا بەم بەخششە، ئامادەو ئاگادار نەبێت، من ڕازی نابم و نامەوێ، پێغەمبەریش هات تابزانێ و سەیری بكا، ئەوسا بەباوكمی فەرموو: مەگەر هەرئاوا بەشی هەموو منداڵەكانت داوە؟ گوتی: نەخێر! پێغەمبەریش فەرمووی: ((إتَّقُوا اللهَ واعْدِلُوا فِي أولادِكُمْ، إنّي لا أشهَدُ علي جَوْرٍ)) متفق علیه. لەریوایەتێكی تردا هاتووە: ((أكُلَّ وَلَدِكَ نَحلْتَ مِثْلَهُ))، واتە: لەخوا بترسن و لەگەڵ گشت منداڵەكانتاندا ڕاست و دادگەربن، بێگومانبە من ئامادەی هیچ جۆرە كارێكی ستەم و ناهەقیی نابم، واتە: دەبێ وەكو بەئەندازەی ئەمە، بەهەموو منداڵەكانت بدەیت، ئەگینە ستەم وناهەقیە، نوعەیم دەڵێ: ئیتر بابم گەڕایەوەو ئەوكارەی هەڵوەشاندەوە/ فتح الباری: ٥/٢٥٠. ﴿ولا یجرمنكم شنآن قوم علی الا تعدلوا﴾ خەشم و قین و دوژمنایەتی هیچ

کەس و هیچ لایەك، واتان لێ نەکات بەعەداڵەت ڕەفتار نەکەن ﴿إعدلوا هو اقرب للتقوى﴾ دەبێ لەگەڵ مەردم دادگەر بن، هەرچەندە ئەوان ناعەدالەت و ناڕێکیش بن، چونکە بێگومان ڕەفتاری دادگەریی و یەکسانی بە تەقواوە نزیکترەو پارێزگاری سنوورەکانی خوای پێدەکرێت ﴿واتقوا الله إن الله خبير بما تعملون﴾ و هەر لەخوا بترسن، چونکە بەڕاستیی هەرکاریٚ بکەن، خوا ئاگاداره لێی ﴿[9] وعدالله الذين آمنوا وعملوا الصالحات لهم مغفرة واجر عظيم﴾ ئەوکەسانەش بڕوایان هێناوەو ئاکاری چاك ئەنجام دەدەن، خوا بەڵێنی لێبوردن و پاداشی زۆرو گەورەی پێداون، بەبەزەیی خۆی دەیانباتە بەهەشتەوە ﴿[10] والذين كفروا وكذبوا بآياتنا﴾ ئەوانەش نکوولی تاك وتەنیایی خوا دەکەن و، بڕوا بە بەڵگەو نیشانەکانمان ناکەن و بەدرۆیان دەزانن ﴿اولئك اصحاب الجحيم﴾ ئەوانە هەموو هاوڕیی دۆزەخن و، هەرگیز لێی دوور ناخرێنەوەو ڕزگاریان نابێ لێی.

الجزء السادس — سورة المائدة

وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَحِيمِ ﴿١٠﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ إِذۡ هَمَّ قَوۡمٌ أَن يَبۡسُطُوٓاْ إِلَيۡكُمۡ أَيۡدِيَهُمۡ فَكَفَّ أَيۡدِيَهُمۡ عَنكُمۡۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴿١١﴾ ۞ وَلَقَدۡ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَبَعَثۡنَا مِنۡهُمُ ٱثۡنَيۡ عَشَرَ نَقِيبٗاۖ وَقَالَ ٱللَّهُ إِنِّي مَعَكُمۡۖ لَئِنۡ أَقَمۡتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَيۡتُمُ ٱلزَّكَوٰةَ وَءَامَنتُم بِرُسُلِي وَعَزَّرۡتُمُوهُمۡ وَأَقۡرَضۡتُمُ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗا لَّأُكَفِّرَنَّ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَلَأُدۡخِلَنَّكُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۚ فَمَن كَفَرَ بَعۡدَ ذَٰلِكَ مِنكُمۡ فَقَدۡ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴿١٢﴾ فَبِمَا نَقۡضِهِم مِّيثَٰقَهُمۡ لَعَنَّٰهُمۡ وَجَعَلۡنَا قُلُوبَهُمۡ قَٰسِيَةٗۖ يُحَرِّفُونَ ٱلۡكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ وَنَسُواْ حَظّٗا مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِۦۚ وَلَا تَزَالُ تَطَّلِعُ عَلَىٰ خَآئِنَةٖ مِّنۡهُمۡ إِلَّا قَلِيلٗا مِّنۡهُمۡۖ فَٱعۡفُ عَنۡهُمۡ وَٱصۡفَحۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٣﴾

١٠٩

## چاکەی خواتان لەبیربێ:

﴿[11] ياايها الذين آمنوا اذكروا نعمة الله عليكم﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! دەبێ یادی نیعمەت و بەخششەکانی خوا بکەنەوە بەسەرتانەوەو لەبیرتان نەچن ﴿إذ هم قوم ان يبسطوا اليكم ايديهم﴾ ئەوجارە کەهۆزی جوولەکەی (بەنی نەزیر) ویستیان دەستی خیانەتتان بۆ درێژ کەن و پەلامارتان بدەن، (ئیبن جەریر) لە(عیکرەمە)وە دەڵێ: پەیامبەر ﷺ خۆیی و، هەندێ لەهاوەڵانی ڕۆیشتن بۆلای هۆزی (بەنی نەزیر) بۆجێبەجێ کردنی کارێکی گرنگ، ئەوسا ئەوانیش ئەوەیان بەهەلزانی و پیلانی خیانەتیان بۆ دارشت و ویستیان هەم خۆیی و هەم هاوەڵەکانی بکوژن! جالەو حاڵەتە ناسکەدا، بەفەرمانی خوای گەورە (جبریل) هات و لەوکارەساتە ئاگاداری کردو، خوایش لەو پیلانە ڕزگاری کردن، ئیتر بۆ لەبیر نەکردنی ئەو بەخششە ئایەتی: (فكف أيديهم عنكم..) هات.

ڕووداوەکەش بەم جۆرە بوو: لەلایەن موسڵمانەکانەوە دووکەس بەهەڵە کوژران، ئەوجا کەس و کارەکەیان هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ داوای خوێنیان لێکرد، پێغەمبەریش ﷺ خۆیی و هەرچوار خەلیفەکانی و (عبدالرحمانی کوڕی عەوف) -ڕووودی خوایان لێ بێ- چوونە لای (بەنی نەزیر) تا بەپێی ڕێککەوتننامەکەی نێوانیان کە: دەبێ لە حاڵەتی ئاوادا هاوکاری یەکتری بکەن، بەشێ لە خوێنەکە بدەن، ئەوسا کە نزیکی مەدینە بونەوە پێشوازییەکی گەرمیان لێکردو جێگایەکیان بۆ حەوانەوەی ئامادەکردو بەڵێنی هاوکاریشیان دایە، بەڵام ئەو ڕۆژەیان بەهەلزانی و هەندێ خەڵکیان ئامادە کرد کەبچنە سەربانی ئەوخانووەی تێیدا دانیشتبوون، تا بەردە ئاشێکی گەورە بخەن بەسەریا! بەڵام خوای گەورە ئاگاداری کرد، ئیتر دەسبەجێ خۆیی و هاوەڵانی هەستان و گەڕانەوە مەدینە، ئیتر بەوبۆنەوە پێغەمبەر ﷺ ڕێکەوتننامەکەی نێوانیانی هەڵوەشاندەوەو خۆی بۆ دەرکردنیان ئامادە کرد، وەك

لەسوورەتی (حەشر)دا هاتووە. دیارە خەیانەتو پیلانی ئاوا یەکەمجاریان نەبوو، بەڵکو چەندجاریٚ شتی ئاوایان لیٚ دووبارەو سیٚ بارە بۆتەوە ﴿فکف ایدیهم عنکم﴾ خوایش دەستی گرتن و نەیهیٚشت زاڵبن بەسەرتانا ﴿واتقوالله﴾ دەسا لەخوا پەرواتان بیٚ و بترسن ﴿وعلی الله فلیتوکل المؤمنون﴾ بروادارانیش دەبیٚ تەنها پشت بەخوا ببەستن. تا هەمووکات فریایان کەویٚت.

**خاوەن نامەکان پەیمان دەدەن و بەر پیێشی دەخەن!:**

﴿[12] ولقد اخذ الله میثاق بنی إسرائیل﴾ بیٚگومان خوا پەیمانی پتەوی لە (نەوەکانی یەعقووب) وەرگرت: کە بەر فەرمان و گویٚرایەڵ بن ﴿وبعثنا منهم اثنی عشر نقیبا﴾ و هەر لەخۆیان دوازدە رابەرو چاودیٚرو سەرۆکمان نارد، لەهەر هۆزیٚك فەرماندەیەکی هەڵبژارد بۆ جیٚبەجیٚ کردنی پەیمانەکە، جابۆدوایش هەرئەوانە بوون کە مووسا ﷺ ناردنیە سەر (کەنعان)ییەکان لە فەلەستین. (ئیبن ئیسحاق) دەڵیٚ: هەڵبژاردنی ئەو دوازدە رابەرە لەورۆژەدابوو کە مووسا بۆجەنگی زۆردارە کەنعانیەکان رووی لەفەڵەستین کرد ﴿وقال الله إنی معکم﴾ و خوا پیٚی فەرموون: بەراستیی من لەگەڵ ئیٚوەم ﴿لئن اقمتم الصلاة وآتیتم الزکاة﴾ ئەگەر ئیٚوە بەریٚکوپیٚکی نویٚژبکەن و زەکات بدەن ﴿و آمنتم برسلی وعزرتموهم﴾ و بەپەیامبەرەکانم باوەڕتان هەبیٚ و، قەدرو ریٚزیان لیٚ بینیٚن و یارمەتیان بدەن ﴿و اقرضتم الله قرضا حسنا﴾ و ماڵی خۆتان بەقەرزو (وام)یٚکی جوان وپەسەند بدەنە خوا، واتە: لەریٚگەی خوادا ماڵ و سامانتان بەخت بکەن ﴿لأکفرن عنکم سیئاتکم﴾ ئەوسا منیش گوناهەکانتان دەپۆشم ﴿ولأدخلنکم جنات تجری من تحتها الأنهار﴾ و ئەتانبەمە ناو چەند باخاتیٚکی بەهەشتەوە کە: چۆم و رووبار بەخوڕ بەبەریاندا دەڕوا ﴿فمن کفر بعد ذلك منکم﴾ ئینجا دوای ئەوپەیمانە هەرکەسیٚکتان ریٚی بیٚ بڕوایی گرتەبەرو، پەیمانەکەی هەڵوەشاندەوە ﴿فقد ضل سواء السبیل﴾ باچاك بزانیٚ کە: ریٚگە ڕاست و رەوانەکەی خوای ونکردووە ﴿[13] فبما نقضهم میثاقهم﴾ ئینجا بەهۆی پەیمان شکاندنەکەیانەوە ﴿لعناهم وجعلنا قلوبهم قاسیة﴾ لەبەزەیی خۆمان و، لەهەق وراستیی دوورمان خستنەوەو، دڵیانمان ڕەش کردو، خیٚرو بەزەییان تیٚدا نەماو، هیچ ئامۆژگارییەکیان وەرنەدەگرت ﴿یحرفون الکلم عن مواضعه﴾ و وشەی پەیمانەکەی خوایان لەجیٚی خۆی گۆڕی ، بە وشەی ترو بەئارەزووی خۆیان هەقیشیان کردە ناهەق و، کەوتنە دوای هەواو ئارەزووی خۆیان و، نەیانتوانی بەباشی لەپەیمانەکە تیٚبگەن وکەڵك وەرگرن ﴿ونسوا حظا مما ذکروا به﴾ و بەشیٚکی زۆری ئەوەی ئامۆژگارییانی پیٚکرابوو، لەبیر خۆیانیان بردەوەو رەفتاریان پیٚنەکرد! ﴿ولا تزال تطلع علی خائنة منهم﴾ هەتا ئیٚستاش کاروکرداری گزیکارییان دەبینیو دەبیسی و، هەرخەریکی پیلان ونەخشەی شەڕن، چونکە هەردەم پیشەیان خیانەتە ﴿إلا قلیلا منهم﴾ بەشیٚکی زۆر کەمیان نەبیٚت ﴿فاعف عنهم واصفح﴾ جا تۆ لەگەڵ ئەوەیشدا چاوپۆشییان لیٚبکەو، لیٚیان مەگرە شایەت بیٚنە سەر ریٚی هەق وراستیی. جەماوەری زانایان دەڵیٚن: حوکمو بڕیاری ئەم ئایەتە لەم شویٚنەدا سڕاوەتەوەو کاری پیٚناکریٚ ﴿إن الله یحب المحسنین﴾ بەڕاستیی خواش چاکەکارانی خۆش ئەویٚ ﴿[14] ومن الذین قالوا إنا نصاری اخذنا میثاقهم﴾ وە هەروەها پەیمانمان لەوانەش وەرگرت گوتیان: ئیٚمە نەسارایِن، بۆئەوە یارمەتیدەری ئاینی خوابن ﴿فنسوا حظا مما ذکروا به فأغرینا بینهم العداوة والبغضاء إلی یوم القیامة﴾ کەچی ئەو بڕیارو ئامۆژگارییە کرابوون زۆریٚکیان لەبیرکرد، ئینجا ئیٚمەیش تا ڕۆژی بەریٚ دوژمنایەتی و رکەبەرایەتیمان لەنیٚوانیاندا بەرپاکرد ﴿وسوف ینبئهم الله بما کانوا یصنعون﴾ لەخوا ئاگاداریان ئەکات لەوکارانەی ئەیانکرد.

## قورئان نوورو رووناکییه:

﴿[١٥] یاأهل الکتاب قد جاءکم رسولنا﴾ ئەی خاوەننامەکان! بەڕاستیی پەیامبەرمان موحەممەد ﷺ هاتەلاتان ﴿یبین لکم کثیرا مما کنتم تخفون من الکتاب﴾ زۆرێ لەوەی کەئێوە لەنامەکەتاندا دەتانشاردەوە ئەو دەریدەخات بۆتان، وەك لە (آل عمران: ٢٣)دا هاتووە: (ألم تر إلی الذین أوتوا نصیبا من الکتاب یدعون إلی کتاب الله لیحکم بینهم ثم یتولی فریق منهم وهم معرضون) وە بەشی لەوەی دەیانشاردەوە ناونیشان و سیفاتی پەیامبەر بوو ﷺ وەك لەسوورەتی (بەقەرە: ٩٨): (وکانوا یستفتحون علی الذین کفروا فلما جاءهم ما عرفوا کفروا به فلعنة الله علی الکافرین)دا هاتووە, حاشاشیان لەوە دەکرد کە خوای کارجوان بەهۆی لاری ئەوانەوە بووبێ کە هەندێ خواردنی حەڵاڵ و خاوێنی لەسەر حەرامکردبن, وەك لەسوورەتی (نیساء: ١٦٠): (فبظلم من الذین هادوا حرمنا علیهم طیبات أحلت لهم) وە لەسوورەتی (ئەنعام: ١٤٦)دا فەرموویەتی: (وعلی الذین هادوا حرمنا کل ذی ظفر ومن البقر والغنم حرمنا علیهم شحومهما) وەدەشیانگوت: هەرشتێك بۆ یەعقووب حەرام نەبووبێت بێگومان لەسەر ئێمەش حەرام نەبووە، کەچی قورئان بەدرۆیان دەخاتەوە، وەك لەسوورەتی (آل عمران: ٩٣)دا فەرموویەتی: (کل الطعام کان حلا لبنی إسرائیل إلا ما حرم إسرائیل علی نفسه من قبل أن تنزل التوراة قل فأتوا بالتوراة فاتلوها إن کنتم صادقین) و دیسان گاورەکانیش موژدەکەی عیسایان بەهاتنی پەیامبەر ﷺ شاردەوە، وەك لەسوورەتی (صەف: ٦)دا هاتووە: (وإذ قال عیسی ابن مریم یا بنی إسرائیل إنی رسول الله إلیکم مصدقا لما بین یدی من التوراة ومبشرا برسول یأتی من بعدی اسمه أحمد). ﴿ویعفو عن کثیر﴾ وە لەزۆرێکیشی بێ دەنگ ئەبێ و چاوپۆشی ئەکا ﴿قد جاءکم من الله نور وکتاب مبین﴾ بێگومان لەلایەن خواوە نوورو نامەیەکی ئاشکراو روون هاتەلاتان.

الجزء السادس — سورة المائدة

وَمِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَٰرَىٰٓ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَهُمۡ
فَنَسُواْ حَظّٗا مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِۦ فَأَغۡرَيۡنَا بَيۡنَهُمُ ٱلۡعَدَاوَةَ
وَٱلۡبَغۡضَآءَ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ وَسَوۡفَ يُنَبِّئُهُمُ ٱللَّهُ
بِمَا كَانُواْ يَصۡنَعُونَ ١٤ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ
قَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمۡ كَثِيرٗا مِّمَّا
كُنتُمۡ تُخۡفُونَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَيَعۡفُواْ عَن
كَثِيرٖۚ قَدۡ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٞ وَكِتَٰبٞ
مُّبِينٞ ١٥ يَهۡدِي بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضۡوَٰنَهُۥ
سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ وَيُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى
ٱلنُّورِ بِإِذۡنِهِۦ وَيَهۡدِيهِمۡ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ
١٦ لَقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡمَسِيحُ
ٱبۡنُ مَرۡيَمَۚ قُلۡ فَمَن يَمۡلِكُ مِنَ ٱللَّهِ شَيۡـًٔا إِنۡ أَرَادَ
أَن يُهۡلِكَ ٱلۡمَسِيحَ ٱبۡنَ مَرۡيَمَ وَأُمَّهُۥ وَمَن فِي
ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗاۗ وَلِلَّهِ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ
وَمَا بَيۡنَهُمَاۚ يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ١٧

١١٠ — وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ

## قورئان دەتخاتە سەر ڕێی هێمنی و ئاشتیی:

﴿[١٦] یهدی به الله من اتبع رضوانه سبل السلام﴾ بێگومان خوای پەروەردگار بەقورئان ڕێنمایی ئەوکەسە دەکات بۆ هەمموو ڕێ و ڕێبازی هێمنی و ئاشتی دەکەونە شوێن ڕەزامەندی و خۆشنوودی ئەو ﴿ویخرجهم من الظلمات إلی النور بإذنه﴾ وەبە فەرمانی خۆی لە گشت ڕێگە تاریکەکانی شیرك و کوفر دەریان دێنێ بۆ ڕووناکی ئیمان ﴿ویهدیهم إلی صراط مستقیم﴾ و بۆ ڕێبازو ڕێی ڕاست ڕێنماییان ئەکات.

## عیساییه‌كان موشریك و كافرن:

﴿١٧ لقد كفر الذين قالوا إن الله هو المسيح ابن مريم﴾ بێگومان ئه‌وانه‌ی گوتیان: خوا خۆی عیسای كوڕی مه‌ریه‌مه‌و له‌ودا جێی بۆته‌وه! بێ باوه‌ڕو كافرن ﴿قل فمن يملك من الله شيئا﴾ ئه‌ی پێغه‌مبه‌ر! ﷺ به‌ نه‌صارا بڵێ: كێ ده‌سه‌ڵاتی كه‌مترین شتی هه‌یه‌ به‌رامبه‌ر به‌خوا, تا رێ له‌بڕیاره‌كانی بگرێت ﴿إن اراد ان يهلك المسيح ابن مريم وأمه ومن فى الأرض جميعا﴾ ئه‌گه‌ر ویستبای (مه‌سیح)ی كوڕه‌كه‌ی مه‌ریه‌م, و دایكی و هه‌رچی تریش له‌زه‌ویدایه‌ له‌ناوببات, جائه‌گه‌ر مه‌سیح خوا ده‌بوو- وه‌كو ئه‌وان ده‌ڵێن- ده‌ سا بابڕیاری خوا ره‌ت بكاته‌وه؟ خۆئاشكرایه‌ كه‌ كه‌سێكی وانییه‌, كه‌وابوو ئه‌وقسه‌ نابه‌جێیانه‌ش نه‌كه‌ن ﴿ولله ملك السموات والأرض وما بينهما﴾ خۆگشت موڵكایه‌تی و ده‌سه‌ڵاتداریێتی ئاسمانه‌كان و زه‌وی و هه‌رچیش له‌نێواندایه‌ هه‌ر بۆخوایه‌ ﴿يخلق ما يشاء﴾ ویستی له‌هه‌ر شتێك بێت دروستی ئه‌كات، بۆیه‌ زۆر ئاساییه‌ عیساش بێ باوك دروست بكا ﴿والله على كل شئ قدير﴾ چونكه‌ خوا به‌ده‌سه‌ڵات و به‌توانایه‌ له‌سه‌ر هه‌مووشت ﴿١٨ وقالت اليهود والنصارى نحن ابناء الله واحباؤه﴾ و جووله‌كه‌كان و فه‌له‌كان گوتیان: ئێمه‌ كوڕان و خۆشه‌ویست و دۆستانی تایبه‌تی خواین و خاوه‌ن رێزین لای ئه‌و، چونكه‌ رۆڵه‌و نه‌وه‌ی په‌یامبه‌رانین ﴿قل فلم يعذبكم بذونبكم﴾ ئه‌ی موحه‌ممه‌د ﷺ پێیان بڵێ: جا وایه! ئه‌ی بۆچی له‌سه‌ر گوناهه‌كانتان سزاتان ئه‌دات؟! ﴿بل انتم بشر ممن خلق﴾ نه‌ء، ئاوا خۆتان دامه‌نێن، ئێوه‌یش هه‌ر ئاده‌مزادن وه‌ك خه‌ڵكی تر خوا دروستی كردوون ﴿يغفر لمن يشاء﴾ هه‌ركه‌سێك خوا خۆی بیه‌وێ لێی خۆشده‌بێ ﴿ويعذب من يشاء﴾ ویستیشی سزای هه‌ركه‌سێك بدات ئه‌یدات، به‌ڵام له‌پاڵ دادپه‌روه‌ریدا ﴿ولله ملك السموات والأرض ومابينهما﴾ و هه‌رچی له‌ئاسمانه‌كان و زه‌ویی و، هه‌رچی له‌نێوانیاندایه‌، هه‌ر هی خوایه‌و چۆنیشی ویست وا ده‌كات ﴿واليه المصير﴾ سه‌ره‌نجام و گه‌ڕانه‌وه‌ی هه‌موویشی هه‌ر بۆلای ئه‌وه‌و پاداشی هه‌موانیش هه‌رلای خۆیه‌تی ﴿١٩ ياأهل الكتاب قد جاءكم رسولنا﴾ ئه‌ی خاوه‌ننامه‌كان! ئه‌وا په‌یامبه‌ری ئێمه‌ (محمد ﷺ) هاته‌ لاتان و، ده‌بێته‌ پێغه‌مبه‌ری هه‌موان و، ده‌بێ گشت باوه‌ڕی پێبێنن و، په‌یڕه‌وی لێبكه‌ن ﴿يبين لكم على فترة من الرسل﴾ پاش ماوه‌یه‌ك كه‌ زنجیره‌ی په‌یامبه‌ران بچراو نه‌هاتن، وائێستا ئه‌م پێغه‌مبه‌ره‌ دێته‌ لاتان و، باسی ئه‌وماوه‌یه‌تان بۆ روون ده‌كاته‌وه، واته: ئه‌وماوه‌ی (٦٠٠) شه‌ش سه‌د ساڵه -وه‌كو هێندێ ده‌ڵێن- كه‌ زنجیره‌ی هاتنی په‌یامبه‌رانی تیاپچڕاو نه‌نێردران، ئه‌م په‌یامبه‌ره‌ نوێیه‌ دێته‌لاتان و، سه‌ر له‌نوێ به‌رنامه‌تان بۆ نوێ ده‌كاته‌وه‌و له‌رابوردو به‌ئاگاتان ده‌كات، پێغه‌مبه‌ر خۆی ﷺ ئه‌فه‌رموێ: (إنَّ أَوْلَى النَّاسِ بِابْنِ مَرْيَمَ لَأَنَا، لَيْسَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ نَبِيٌّ). فتح الباري. واته: به‌ڕاستیی من له‌ هه‌مووكه‌سێك به‌كوڕه‌كه‌ی (مه‌ریه‌م)ه‌وه

الجزء السادس — سورة المائدة

وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ وَٱلنَّصَٰرَىٰ نَحْنُ أَبْنَٰٓؤُا۟ ٱللَّهِ وَأَحِبَّٰٓؤُهُۥ ۚ قُلْ
فَلِمَ يُعَذِّبُكُم بِذُنُوبِكُم ۖ بَلْ أَنتُم بَشَرٌ مِّمَّنْ خَلَقَ ۚ يَغْفِرُ لِمَن
يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ ۚ وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ
وَمَا بَيْنَهُمَا ۖ وَإِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٨﴾ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ قَدْ جَآءَكُمْ
رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمْ عَلَىٰ فَتْرَةٍ مِّنَ ٱلرُّسُلِ أَن تَقُولُوا۟ مَا جَآءَنَا
مِنۢ بَشِيرٍ وَلَا نَذِيرٍ ۖ فَقَدْ جَآءَكُم بَشِيرٌ وَنَذِيرٌ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ
شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٩﴾ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَٰقَوْمِ ٱذْكُرُوا۟
نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَعَلَ فِيكُمْ أَنۢبِيَآءَ وَجَعَلَكُم مُّلُوكًا
وَءَاتَىٰكُم مَّا لَمْ يُؤْتِ أَحَدًا مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٠﴾ يَٰقَوْمِ ٱدْخُلُوا۟
ٱلْأَرْضَ ٱلْمُقَدَّسَةَ ٱلَّتِى كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمْ وَلَا تَرْتَدُّوا۟ عَلَىٰٓ أَدْبَارِكُمْ
فَتَنقَلِبُوا۟ خَٰسِرِينَ ﴿٢١﴾ قَالُوا۟ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّ فِيهَا قَوْمًا جَبَّارِينَ
وَإِنَّا لَن نَّدْخُلَهَا حَتَّىٰ يَخْرُجُوا۟ مِنْهَا فَإِن يَخْرُجُوا۟ مِنْهَا
فَإِنَّا دَٰخِلُونَ ﴿٢٢﴾ قَالَ رَجُلَانِ مِنَ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ
أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمَا ٱدْخُلُوا۟ عَلَيْهِمُ ٱلْبَابَ فَإِذَا دَخَلْتُمُوهُ
فَإِنَّكُمْ غَٰلِبُونَ ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓا۟ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٢٣﴾

١١١

عیسا ﷺ نزیکترم، چونکە لەنێوانماندا هیچ پێغەمبەرێك نەبووە ﴿أن تقولوا ما جاءنا من بشیر ولا نذیر﴾ لەبەرئەوە
کە لەڕۆژی دواییدا نەڵێن: لەخواوە هیچ مژدەدەرو ترسێنەرێکمان بۆنەهات ﴿فقد جاءکم بشیر ونذیر﴾ دەسا ئەوا
مژدەدەرو ترسێنەرتان هاتەلا، ئیتر هیچ بیانوویەکتان نەما ﴿والله علی کل شئ قدیر﴾ خوایش بەسەر هەمووشتێکدا
دەسەڵاتدارەو دەتوانێ تۆڵەی یاخییان بداو، پاداشی بەرفەرمانان مسۆگەر بکات.

**قودسی پیرۆزو، یاخیی بوونی جوولەکە:**

﴿[٢٠] وإذ قال موسی لقومە﴾ ئەوکاتەیان وەبیربێنە کە: مووسا بەگەلەکەی خۆیگوت: ﴿یا قوم اذکروا نعمة الله
علیکم﴾ ئەی هۆزی من! دەبێ ئێوە یادی نیعمەت و بەخششەکانی خوا بکەنەوە بەسەرتانەوە ﴿إذ جعل فیکم
انبیاء﴾ چونکە ئەوهەموو پەیامبەرانەی دەستەدەستە لەنێوخۆتاندا بۆناردن ﴿وجعلکم ملوکا﴾ و پاشایەکی
زۆریشی هەرلەخۆتان فەراهەم هێناو، ژیانێکی خۆشتان بەسەر بردوو، لەفیرعەونیش ڕزگارتان بوو ﴿وآتاکم مالم
یؤت احدا من العالمین﴾ و بەخششی وای پێدان کە لەم جیهانەدا بەهیچ کەسێکی نەدابوو: دەریاتان بۆ لەتبوو،
دوژمنتان نقومبوو و لەئاوخنکا.. ﴿[٢١] یا قوم ادخلوا الأرض المقدسة التی کتب الله لکم﴾ ئەی گەلەکەم! بچنە ئەو
زەوییە پیرۆزەوە (بیت المقدس) کە خوا بڕیاری داوە، بیکاتە جێگاو بارەگاتان ﴿ولا ترتدوا علی اعقابکم﴾ و
لەجیهاد پاشەکشە مەکەن و مەگەڕێنەوەو، لەترسی دوژمن هەڵمەیەن ﴿فتنقلبوا خاسرین﴾ ئەوسا زیانبارو
خەسارەتمەند ببن ﴿[٢٢] قالوا یا موسی إن فیها قوما جبارین﴾ کەچی وتیان: ئەی مووسا! ئێمە دەزانین کە گرووپ و
گەلێکی زۆرسەرکەش و بەتواناو ستەمکاری لێیەو، ئێمە دەرەقەتیان نایەین ﴿وإنا لن ندخلها﴾ و هەرگیز ناچینە
ئەوێ ﴿حتی یخرجوا منها﴾ هەتا ئەوانە نەچنە دەر لێی ﴿فإن یخرجوا منها﴾ جائەگەر -بێ جەنگو سەرئێشە-
لەوێ بچنە دەرێ ﴿فإنا داخلون﴾ بێگومان ئەوکاتە ئێمەیش دەچینەناویەوە ﴿[٢٣] قال رجلان من الذین یخافون﴾
بەڵام دووپیاوی صالح و لەخوا ترس (یوشع، کالب) لەدوانزە فەرماندەکەیان ﴿انعم الله علیهما﴾ خوا نازونیعمەتی
خۆی ڕشتبوو بەسەریاندا بەبڕوای بەهێزو چاوی نەترس و دڵی دامەزراوەوە بە قەومەکەیانیان گوت: ﴿ادخلوا
علیهم الباب﴾ لەدەروازەی شارەوە بچنە سەریان و یەك هێرشی سەخت بکەن و، لێیان مەترسن ﴿فإذا دخلتموه
فإنکم غالبون﴾ جا هەر کە چوونە ناوشارەوە، ئیتر بەڕاستیی ئێوە زاڵ دەبن ﴿وعلی الله فتوکلوا إن کنتم مؤمنین﴾
ودەبێ بۆ سەرکەوتنش تەنها پشت بەخوا ببەستن، ئەگەر ئێوە بڕوای ڕاستەقینەتان هەیە ﴿[٢٤] قالوا یا موسی إنا لن
ندخلها أبدا ماداموا فیها﴾ کەچی وتیان: ئەی مووسا! دڵنیابە هەرگیز ئێمە ناچینە ئەوشارەوە تا ئەوانی لێ بێت!
﴿فاذهب انت وربك فقاتلا إنا هاهنا قاعدون﴾ جائیتر تۆ فەرمووخۆت و پەروەردگارت، بچن جەنگیان لەگەڵ بکەن،
ئێمە وا لێرە دانیشتووین و نایەینە جەنگ، وەڵامیان بۆ مووسا ﷺ، ئاوابوو! بەڵام وەڵامی (سەعد) ڕۆژی (بەدر) بۆ
پێغەمبەر ﷺ ئەمە بوو گوتی: سوێند بەوزاتەی تۆی بەڕاست و ڕەوا ناردووە، ئەگەر بچیتە نێو دەریاوە، ئێمەش
بەپەلە خۆمانی تێدەخەین. ﴿[٢٥] قال ربی إنی لا املك إلا نفسی واخی﴾ ئەوجا مووسا وتی: پەروەردگارم! خۆت
دەزانی کە بەڕاستیی من تەنها دەسەڵاتی خۆم و براکەمم هەیە، ئێمە دەرەقەتی ئەوان نایەین ﴿فافرق بیننا وبین
القوم الفاسقین﴾ دەسا تۆ ئێمە لەو گەلە ستەمکارو لەسنوور دەرچووە لێکجیا بکەوەو هەمووکەسێکیش بەتۆڵەو
پاداشی خۆی بگەیەنە ﴿[٢٦] قال فإنها محرمة علیهم اربعین سنة﴾ جا خوا فەرمووی: دەوا ئەو زەوییە پیرۆزەیان (شام
و فەلەستین) لێ یاساغەو نابێ پێی تێبخەن و، دەبێ بۆماوەی چل دانەساڵ ﴿یتیهون فی الأرض﴾ لەوزەویەدا بە
وێڵی و سەرگەردانی بسووڕێنەوەو ڕێگە دەرنەکەن ﴿فلا تأس علی القوم الفاسقین﴾ ئەوسا تۆیش بۆ ئەم گەلە

یاخیی و سەرپێچی کەرە خەم وخەفەت مەخۆ. تەفسیری (تەسهیل) لە (ئیبن عەباس)ـەوەدەڵێ: شەوانە دەڕۆیشتن، بەڵام کە ڕۆژیان لێدەبوویەوە سەیر دەکەن، هەرلەجێگای خۆیاندان، چل ساڵ ئەوە کارو پیشەیان بوو.

**ڕێنماییەکانی ئایەتی (٢٤-٢٦):** ترسنۆکی و بێ جورئەتی یەهوودو بێ ئەدەبییان بەرامبەر بەخواو بەپێغەمبەرانیان ! بێزاریی و بەرائەت لەکاری خراپی خراپکاران و داوای خەشم و تووڕەیی خوا بۆیان، بایەخ نەدان و خەم و خەفەت نەخواردن بۆ ستەمکاران، بەتایبەت ئەو دەمەی وا سزای خوایان بۆ دێ.

**سەرگروشتەکەی ( هابیل ) و ( قابیل ):**

﴿[٢٧] واتل علیهم نبأ ابني آدم بالحق﴾ ئەی پێغەمبەر ﷺ! تۆ بەسەرهات و ڕووداوەکەی نێوان هەردوو کوڕەکەی
ئادەم (هابیل و قابیل) یان بەراست و ڕەوان بۆ بخوێنەوە، تاچاک بزانن کە ئەنجامو پاشەڕۆژی مرۆڤی ستەمکارو فێڵباز بێ ئاکامەو، بەشکو عیبرەتیشی لێوەربگرن ﴿إذ قربا قربانا﴾ ئەو حەلە کەهەردووکیان بەمەبەستی نزیکبوونەوە لەخواو، گیرابوونی مەبەستەکەیان، یەکی قوربانی و خێرێکیان کرد ﴿فتقبل من احدهما﴾ ئینجا لەیەکێکیان (هابیل) کە ڕاستو، لەخواترس بوو وەرگیرا ﴿ولم یتقبل من الآخر﴾ ولەوی تریان (قابیل) وەرنەگیرا، چونکە مرۆیەکی کەللە ڕەق و لەخوا نەترس بوو. تەفسیری تەبەریی دەڵێ: (عەبدوڵڵای کوڕی عومەر) دەڵێ: هابیل باشترین ماڵو سامانی خۆی بەخشی و بەخت کرد، ئەوسا خوایش لێی وەرگرت، بەڵام چونکە (قابیل) خراپترین سامانی خۆی بەخت کرد، خواش ڕەتیکردەوەو لێی وەرنەگرت ﴿قال لأقتلنك﴾ کەچی ئەمەیان کە قوربانیەکەی لێ وەرنەگیرا وتی: بەڕاستیی من دەبێ تۆ بکوژم، ئەی چۆن خێرەکەی من وەرنەگیرا؟ ﴿قال إنما یتقبل الله من المتقین﴾ (هابیل) وتی: جا من چی بکەم، بەڕاستیی خوا تەنها لەپارێزکاران خێرو



قَالُوا يَا مُوسَىٰ إِنَّا لَن نَّدْخُلَهَا أَبَدًا مَّا دَامُوا فِيهَا ۖ فَاذْهَبْ
أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَاتِلَا إِنَّا هَاهُنَا قَاعِدُونَ (٢٤) قَالَ رَبِّ
إِنِّي لَا أَمْلِكُ إِلَّا نَفْسِي وَأَخِي ۖ فَافْرُقْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ الْقَوْمِ
الْفَاسِقِينَ (٢٥) قَالَ فَإِنَّهَا مُحَرَّمَةٌ عَلَيْهِمْ ۛ أَرْبَعِينَ سَنَةً ۛ
يَتِيهُونَ فِي الْأَرْضِ ۚ فَلَا تَأْسَ عَلَى الْقَوْمِ الْفَاسِقِينَ
الحزب ١٢ (٢٦) ۞ وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ ابْنَيْ آدَمَ بِالْحَقِّ إِذْ قَرَّبَا قُرْبَانًا
فَتُقُبِّلَ مِنْ أَحَدِهِمَا وَلَمْ يُتَقَبَّلْ مِنَ الْآخَرِ قَالَ لَأَقْتُلَنَّكَ ۖ
قَالَ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ اللَّهُ مِنَ الْمُتَّقِينَ (٢٧) لَئِن بَسَطتَ إِلَيَّ يَدَكَ
لِتَقْتُلَنِي مَا أَنَا بِبَاسِطٍ يَدِيَ إِلَيْكَ لِأَقْتُلَكَ ۖ إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ
رَبَّ الْعَالَمِينَ (٢٨) إِنِّي أُرِيدُ أَن تَبُوءَ بِإِثْمِي وَإِثْمِكَ فَتَكُونَ
مِنْ أَصْحَابِ النَّارِ ۚ وَذَٰلِكَ جَزَاءُ الظَّالِمِينَ (٢٩) فَطَوَّعَتْ
لَهُ نَفْسُهُ قَتْلَ أَخِيهِ فَقَتَلَهُ فَأَصْبَحَ مِنَ الْخَاسِرِينَ (٣٠)
فَبَعَثَ اللَّهُ غُرَابًا يَبْحَثُ فِي الْأَرْضِ لِيُرِيَهُ كَيْفَ يُوَارِي
سَوْءَةَ أَخِيهِ ۚ قَالَ يَا وَيْلَتَىٰ أَعَجَزْتُ أَنْ أَكُونَ مِثْلَ هَٰذَا
الْغُرَابِ فَأُوَارِيَ سَوْءَةَ أَخِي ۖ فَأَصْبَحَ مِنَ النَّادِمِينَ (٣١)



قوربانی وەردەگرێ ﴿[٢٨] لئن بسطت إلی یدك لتقتلني﴾ ئەگەر تۆش دەست بۆ من درێژ بکەیت کە بمکوژی ﴿ما انا
بباسط یدی إلیك لأقتلك﴾ هەرگیز من دەست لەتۆ ناکەمەوە تۆ بکوژم ﴿إني اخاف الله رب العالمین﴾ چونکە
بەڕاستیی من لەسزای خوای پەروەردگاری جیهانەکان دەترسم ﴿[٢٩] إني ارید أن تبوء بإثمي وإثمك﴾ دەمەوێ
تاوان و گوناهی کوشتنی من و، تاوان و گوناهی گیرا نەبوونی قوربانی و خێرەکەی خۆیشت هەڵگریت، من نامەوێ
خۆم گوناهبار بکەم ﴿فتکون من أصحاب النار﴾ جا بەوهۆیەوە ببیتە هاوڕیی ئاگری دۆزەخ ﴿وذلك جزاء الظالمین﴾
و ئەوەیشە دەبێ تۆڵەی ستەمکاران ﴿[٣٠] فطوعت له نفسه قتل اخیه﴾ ئینجا نەفس و دەروونی (قابیل)، کوشتنی
هاروونی برای لا شیرین و ئاسان کردوو بەکارێکی چاکی دایە قەڵەم ! ﴿فقتله فأصبح من الخاسرین﴾ بۆیە
فورسەتی لێهێناو کوشتی و چووە ریزی زیانمەندانەوە ﴿[٣١] فبعث الله غرابا یبحث فی الأرض﴾ ئینجا خوا قەلە

ڕەشـەیەکی نـاردو، بـەدەنووك و چنگ خـەریکبوو زەوییەکـە بکـۆڵێ و گڵەکـەی فـڕێ بـدا، بـۆ قەلـە ڕەشـێکی تـری مردارەوە بوو ﴿لیریة کیف یواری سوءة اخیه﴾ هەتا نیشانی بکوژەکە بدات، ئەویش چۆن لاشەی براکەی لەخاکا بشارێتەوە ﴿قال یا ویلتی اعجزت ان اکون مثل هذا الغراب﴾ ئەوساکە بکوژەکە (قابیل) ئەوەی دی وتی: داخ و حەسرەت بۆ من! چون نەمزانی وەك ئەم قەلەڕەشە بکەم لاشەی هاوڕێکەی خۆی شاردەوە ﴿فأواری سوءة اخی﴾ منیش لاشەو تەنی براکەم بشارمەوە ﴿فاصبح من النادمین﴾ ئینجا بەو کردەوە چووە ڕیزی پەشیمانان و، پەنجەی حەسرەت وپەشیمانی گەست.

ڕێنماییەکانی ئایەتی (٢٧-٣١):

١- دەبـێ بەهـەموو کـارێکی چـاك، بـەخواوە نزیـك ببینەوە.

٢- گـەورەیی تـاوانی حەسـوودیی و شـوێنەوارە بەدفەڕەکەی.

٣- کردەوەی چاك هەر بەئیخلاس مەرجی ڕێکبوونی لەگەڵ شەرع وەردەگیردرێ.

٤- (قابیـل) یەکـەم کەسـێ بـوو کـە تـاوانی کوشـتنی داهێنا، بۆیە پێغەمبەر دەفەرموێ: ((مَا مِنْ نَفْسٍ تَقْتُلُ نَفْساً ظُلْماً إلا كان على ابنِ آدمَ الأولِ كِفْلٌ، ذلك بأنه أول مَنْ سَنّ القَتْلَ))، واتـە: هـەر لەوکاتـەوە هـەتا ڕۆژی سـەلا هەرکەسێك بەناهەق بکوژرێت، بەشێك لەوتاوانە دەکەوێتە سەر گەردنی کوڕە یەکەمەکەی ئادەم ، چونکە ئەو یەکـەم کـەس بوو کوشتنی داهێنا.

٥- شاردنەوەو لەگۆڕنانی مردوو واجیب و پێویستەو، باشترین دووکوڕەکەی ئادەم: بەناهەق کوژراوەکەیانە.

الجزء السادس — سورة المائدة

مِنْ أَجْلِ ذَٰلِكَ كَتَبْنَا عَلَىٰ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَنَّهُۥ مَن قَتَلَ
نَفْسًۢا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي ٱلْأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ
ٱلنَّاسَ جَمِيعًا وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَآ أَحْيَا ٱلنَّاسَ
جَمِيعًاۚ وَلَقَدْ جَآءَتْهُمْ رُسُلُنَا بِٱلْبَيِّنَٰتِ ثُمَّ إِنَّ كَثِيرًا
مِّنْهُم بَعْدَ ذَٰلِكَ فِي ٱلْأَرْضِ لَمُسْرِفُونَ ﴿٣٢﴾ إِنَّمَا
جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسْعَوْنَ فِي ٱلْأَرْضِ
فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوْ يُصَلَّبُوٓاْ أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ
وَأَرْجُلُهُم مِّنْ خِلَٰفٍ أَوْ يُنفَوْاْ مِنَ ٱلْأَرْضِۚ ذَٰلِكَ
لَهُمْ خِزْيٌ فِي ٱلدُّنْيَاۖ وَلَهُمْ فِي ٱلْأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ
﴿٣٣﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِن قَبْلِ أَن تَقْدِرُواْ عَلَيْهِمْۖ فَٱعْلَمُوٓاْ
أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٤﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ
ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱبْتَغُوٓاْ إِلَيْهِ ٱلْوَسِيلَةَ وَجَٰهِدُواْ فِي سَبِيلِهِۦ
لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٣٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْ أَنَّ
لَهُم مَّا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُۥ مَعَهُۥ لِيَفْتَدُواْ بِهِۦ مِنْ
عَذَابِ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ مَا تُقُبِّلَ مِنْهُمْۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٣٦﴾

١١٣

**مرۆڤ دەبێ ڕێز لە مرۆڤ بگرێ:**

﴿٣٢ من اجل ذلك﴾ جا لەبەر بێ فەڕی و خراپی ئەو کوشتنە نادروست ونارەوایە، وە بۆئەوە جارێکی تر کاری وا ڕوونەداتەوە ﴿کتبنا علی بنی إسرائیل﴾ لەسەر نەوەکانی (یەعقوب)مان بڕیاردا ﴿انه من قتل نفسا بغیر نفس﴾ کە هەرکەسێك بەناهەق مرۆڤێك بکوژێ ﴿او فساد فی الأرض﴾ یان بێ ئەوە کارێکی خراپ و گەندەڵی لەوڵاتدا کردبێ (وەك ڕێگرتن و شەڕیکدانان بۆخوا، وەیان هەر هۆیەکی تر لەو بابەتانە کە دەبێتە هۆی کوشتنەوە) ﴿فکأنما قتل الناس جمیعا﴾ وەکو هەموو خەڵکی سەر زەویی کوشتبێ ﴿ومن احیاها فکأنما احیا الناس جمیعا﴾ هەرکەسێکیش مرۆڤێکی بێ تاوان لەمەرگ ڕزگار بکا، وابزانێ کە تەواوی خەڵکی لەمەرگ ڕزگار کردووە و ژیانی پێبەخشیوە. بەڵێ ئەو دووبارەیە هەردووکیان قەدرو ڕێزنانە لەئادەمیی و پاراستنیەتی لەکوشتن ﴿ولقد جاءتهم رسلنا بالبینات﴾ خۆ بەردەوام پەیامبەرانیشمان بەچەند بەڵگەی

روونەوە هاتنە لایان، تا بەڵکو لەهەق لانەدەن ﴿ثم إن كثيرا منهم بعد ذلك﴾ کەچی دوای هاتنەکەشیان گەلێکیان ﴿في الأرض لمسرفون﴾ بە پیاوکوژو سنوور بەزێن دەرچوون لە زەوییدا!.

رێنمایەکانی ئایەتی (٣٢):

١- خوا بەنی (یەهوود)ی توندکردەوە، بۆیە پاش ئەوهەموو خوێن ڕشتنەیان تۆڵەی سەختی بۆ دانان.

٢- فەسادو خراپکاری (بەنی ئیسرائیل) وەنەبێ لەنەزانینەوە بووبێ، نەخێر، بەڵکو شوێنی هەواو ئارەزووی خۆیان کەوتن و، لە ئەنجامیشدا غەزەبی لێگرتن، مەبەست بەمانەش کەلەم ئایەتانەدا هاتوون، هەر ئەوانن لە: (غير المغضوب عليهم)١/٧. یان (ياأيها الذين آمنوا لا تتولوا قوما غضب الله عليهم..) ٦٠/٣١ دا باسکراون.

**تۆڵەی ئەوانەی دژی خواو پێغەمبەر خراپە دەکەن:**

(ئیبن کەسیر) -وەك لەبوخاریدا هاتووە- دەڵێ: کاتێ هۆزی (عورەینە)، لەئیسلام پاشگەز بوونەوەو، پاشان شوانەکەی پەیامبەریان ﷺ کوشت و، وشترەکانیشیان بەتاڵان برد، ئەم ئایەتە هاتە خوارەوەو فەرمووی: ﴿[٣٣] إنما جزاء الذين يحاربون الله ورسوله﴾ بێگومان تۆڵەو جەزرەبەی کاری خراپی ئەوانەی دژایەتی لەگەڵ خواو پێغەمبەری ئەودەکەن و، دژی ئەو دەجەنگن و دەکوژن و هێرش دەکەنە سەر شارو گوندەکان ﴿ويسعون في الأرض فسادا﴾ بەردەوامیش لە عەرزدا هەوڵی فەسادوکاری گەندەڵی و خراپە کاری دەدەن و، ڕێ لەخەڵکیش دەگرن، تۆڵەیان ئەوەیە کە: ﴿أن يقتلوا﴾ ئەوانەیان خەڵکیان کوشتووە، دەبێ بەتوندیی و بێ بەزەییانە بکوژرێن ﴿أو يصلبوا﴾ ئەوانەشیان خەڵك دەکوژن و سامانیشیان دەبەن، دەبێ هەڵواسرێن و لەدار بدرێن ﴿أو تقطع أيديهم وأرجلهم من خلاف﴾ ئەوانەشیان تەنها سامانی خەڵك بە تاڵان دەبەن، دەبێ یان دەست و پێیان -ڕاست و چەپ- ببڕدرێ ﴿أو ينفوا من الأرض﴾ یان شار بەدەر بکرێن، لەشارێکەوە بۆ شارێکی تر، وەیان زیندانی بکرێن، ئەگەر تەنها خەڵکیان دەترسان، واتە: نەکەسیان دەکوشت و نەداراییشیان دەبرد ﴿ذلك لهم خزي في الدنيا﴾ لەدنیادا ئەوە ریسوایی و سەرشۆڕییە بۆیان ﴿ولهم في الآخرة عذاب عظيم﴾ و لەدواڕۆژیشدا سزایەکی گەورەیان بۆ هەیە. بەڵێ.. ئەم مەسەلەی دژایەتیی و ڕێگرتنەیە درێژەیەکی هەیەو، لەکتێبە فیقهی یەکاندا وەك پێویست باسکراوە، بۆیە لێرە ئێمە درێژەی نادەینێ ﴿[٣٤] إلا الذين تابوا من قبل أن تقدروا عليهم﴾ مەگەر ئەوانەیان پێش ئەوە بیانگرن و دەسەڵات پەیدا کەن بەسەریاندا ، پەشیمان ببنەوە، دیارە ئەودەمە ئیتر مافی خوایان لەکۆڵ دەکەوێ و، تەنیا مافی ئادەمییان لەسەر دەمێنێ و، دەبێ ئەوماڵە بدەنەوە، یان بیبژێرن ﴿فاعلموا أن الله غفور رحيم﴾ بشزانن کە بەڕاستیی خوا زۆر لێبوردەیە، زۆریش میهرەبانە، هەرکەس گەڕایەوەلای، لێیخۆش دەبێ.

رێنمایەکانی ئایەتی (٣٣-٣٤):

دیاریکردنی تۆڵەی ڕێبڕو ئەوانەی کە لەدەسەڵاتی سەرداری ئیسلامیی سەردەم دەردەچن و هێزو تواناو چەکیان هەیەو، دەچنە شاخ و دەشت و دەرو، دەست دەکەنە هێرش بردنە سەر موسڵمانان، جا ئەوانە خۆیان دەکوژرێن و، ماڵ و سامانیان دەبرێت، تۆڵەی دنیاشیان ئەوەیە کە لەئایەتەکەدا باسکراوە، لەقیامەتیشدا دوای ئەوەی کە لەدنیادا تۆڵەیان لێکرایەوە، خوا لەگوناحەکانیان دەبووری: ((فمَنْ وفَى مِنْكُمْ فَأَجْرُهُ عَلَى اللهِ، ومَنْ أصابَ مِنْ ذلك شيئا فَعُوقِبَ بِهِ فهو كَفَّارَةٌ لَهُ، ومَنْ أصابَ مِنْها شيئا وسَتَرَهُ اللهُ فَأَمْرُهُ إلى الله إن شاءَ عَذَّبَهُ وإنْ شاءَ غَفَرَ لَهُ)). واتە: ئەوی بۆ تۆڵەو جەزرەبە لێوەرگرتن، خۆی بەدەستەوە بدا، پاداشەکەی دەکەوێتە لای خوا، ئەوەش کاری لەوانە دەکاو ئەوجار تۆڵە دەدرێ، دەبێتە کەفارەت و مایەی پۆشینی گوناحانی، هەرکەسێکیش تووشی کاری

لەوانە بوو، ئەوجار خواش لێیداپۆشی، ئەوەحەواڵەی خوایە، ویستی سزای دەدا، یان لێی خۆش دەبێ. موسلیم/ کتاب الحدود: ١٣٣٣.

**جەماوەری زانایان دەڵێن:** جەردەش بەعەرەبی (لص) حسابی (موحاریب)ـی بۆ دەکرێت، جا بۆ یەکەمجار داوای لێدە«کرێ واز بێنێ، خۆئەگەر هەر وازی نەهێنا، ئەوا جەنگی لەگەڵ دەکرێ، ئەوسا ئەگەر تۆ لەپێناو دیفاعدا کوژرایت، شەهیدو بەهەشتی ئەبی، خۆئەگەر جەردەکە کوژرا، خوێنی بەفیڕۆ دەچێت، (ئەبو هورەیرە) -خوای لێ ڕازی بێت- بۆ پشتگیری ئەو ڕاستییە ئەم فەرموودەیە دێنێ کە: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر گوتی: ئەر مرۆڤێك ویستی دەس بەسەر ماڵەکەمدا بگرێت؟ فەرمووی: نەیدەیتێ، وتی:ئەی ئەگەر جەنگی لەگەڵ کردم، فەرمووی: جەنگی لەگەڵ بکەو بیکوژە، گوتی ئەی ئەگەر ئەو منی کوشت؟ فەرمووی: تۆ شەهیدیت، گوتی: ئەگەر من ئەوم کوشت؟ فەرمووی: لەدۆزەخدایە.

**جەماوەری زانایان دەڵێن:** هەڵبژاردن و دیاریکردنی یەکێ لەو سزایانە بەرامبەر بە جەردە، یان بۆ ڕێبڕ و (محارب) ئیختیاری ئیمام و پێشەوایە، ئەو دەتوانێ بەپێی بەرژەوەندی ئەوکاتەی موسڵمانان، یەکێ لەو سزایانە دیاری بکا، بەو مەرجە بێژەی (أو) لەئایەتەکەدا بۆ (تەغییر) دابنرێ، وەکو هەندێ دەڵێن: ئەگەرنا بەپێی تەفسیرەکەی ئێمە هەرکەسێ -بەر لەگرتنی- تەوبە بکا، لێی دەبووردرێ، مەگەر خۆی داوای تۆڵە بکا، وەیا ماڵەکەی لامابوو، ئەوە لێی وەردەگیردرێ و دەدرێتەوە دەستی خاوەنەکەی، ڕەحمەت و میهرەبانی خوای گەورە زۆر زۆرە.

**لە خوا بترسن و بچنە جیهاد:**

﴿ [٣٥] یاأیهاالذین آمنوا اتقواالله﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! دەبێ لەنافەرمانی خوا خۆ بپارێزن و، بەردەوام بەرفەرمانی بن ﴿وابتغوا إلیه الوسیلة﴾ بۆ نزیکبوونەوەشتان بەخواوە، هەر هۆکارو کردەوەیەك دەزانن نزیکتان دەکاتەوە لای ئەو، دەشێ ئێوە هەوڵی بۆ بدەن و بیکەن، هەتا ڕەزامەندی ئەو بەدەست بێنن ﴿وجاهدوا في سبیله﴾ لەپێناو ڕێگەی خواشدا هەمیشە کۆشش بکەن و، هەوڵ بدەن و بچنە غەزا ﴿لعلکم تفلحون﴾ بەشکو لەهەردوو جیهاندا سەرفرازو بەختیار بن ﴿ [٣٦] إن الذین کفروا﴾ ئەوانەی خوانەناس و بێ باوەڕن ﴿لو أن لهم ما فی الأرض جمیعا﴾ ئەگەر هەرچی خێرو بیرێك لەزەویدایە هی ئەوان بێت ﴿ومثله معه لیفتدوا به﴾ و ئەوەندەی تریشی لەگەڵ بخەن، بۆئەوەی (فیدیە)و بریتی بێ بۆ خۆ ڕزگارکردنیان ﴿من عذاب یوم القیامة﴾ لەسزای ڕۆژی قیامەت ﴿ما تقبل منهم ولهم عذاب الیم﴾ لێیان وەرناگیردرێ، وسزایەکی ئێش پێگەیەنەریشیان بۆ هەیە ﴿ [٣٧] یریدون أن یخرجوا من النار﴾ هەمووکات هەوڵ دەدەن و دەیانەوێ لەو ئاگرو سزایە بێنە دەرێ و خۆ ڕزگار بکەن ﴿وماهم بخارجین منها﴾ بەڵام هەرچی هەوڵ بدەن قەد لێی نایەنە دەرێ و دەرباز نابن ﴿ولهم عذاب مقیم﴾ وسزایەکی نەبڕاوەشیان بۆ دەبێ.

**ڕێنمایەکانی ئایەتی (٣٥-٣٧):**

١- گشت کات دەبێ لەخوا تەقوات هەبێ و، هەوڵی نزیکبوونەوە لەو بدەیت، وەدەبێ بەردەوام لەپێناو ئەودا جیهاد بکرێ.

٥- بەدەست هێنانی (وەسیلە)واتە: پەیداکردنی هەر هۆیەکی خۆ نزیك کردنەوە بەخواوە واجیبە.

**زانایان لە پێناسەی (وسیلە)دا دەڵێن:** ((فکل قربة هی وسیلة تقرب من رضا الله، وعلیه فکل الأعمال الصالحة هی وسیلة)) هەموو کارێکی چاك و باش، هۆکاری نزیکبوونەوەیە لەخوا، کەوابوو گش ئاکارێکی باش (وەسیلە)یە. وە

لەفەرموودەی صەحیح دا هاتووە: ((ما تَقَرَّبَ إلَيَّ عَبْدٌ بشئ أَحَبّ إلَيَّ مما افْتَرَضْتُ عَلَيْهِ)). واتە: هیچ بەندەیەك ناتوانێ بەباشترو چاكتر لەفەرزەكان، لەمنەوە نزیك بێتەوە.

(وەسیلە) بە جێگاو بارەگایەكی هەرەبەرزیش لە بەهەشتدا دەڵێن، وەك پێغەمبەر دەفەرموێ: ئەوی بانگ ببیسێ و پاشان بڵێ: ((اللهم ربّ هذه الدعوةِ التامةِ،والصلاةِ القائمةِ، آتِ محمداً الوَسِيلةَ والفَضِيلَةَ، وَابْعَثْهُ مَقاماً محمودا الذي وَعَدْتَهُ))شەفاعەتی منی بۆ پێویست دەبێ. یان دەفەرموێ: ((ثم سَلُوا لِيَ الوسيلةَ، فإنها منزلة في الجنة لا تنبغي إلا لعبد من عباد الله، وأرجو أن أكون أناهو، فمن سأل لي الوسيلة حلت له الشفاعةُ)) فتح الباری.

**روونكردنەوەیەك:** ڕاڤەكەرانی قورئان یەكدەنگن كە(وەسیلە) بریتیە لە هەمووكاروكردەوەیەكی چاك. (ئالووسی) دەڵێ: هەندێ كەس لەڕێی ئەم ئایەتەی: (وابتغوا إليه الوسيلة..)وە، پەنا دەبەنەبەر (صالحان)و چاكان و دەیانكەنە (وەسیلە)ی نێوان خواو بەندەكانی و، خاتریان دەبەنە بەرخواو دەڵێن: (أَللَّهُمَّ إنا نُقْسِمُ عليك بفلان أنْ تُعْطِيَنَا كذا) هەشیانە پەنادەبەنە بەرمردوو، یان بەرپیاو چاكێكی نادیارو (غاییب)و دەڵێ: (یا فلانُ ادعُ الله تعالى ليرزقني كذا و كذا) وادەزانن ئەوە، بەكارهێنانی (وەسیلە)یە! فەرموودەیەكی ئاواش لەپێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕنەوە: (إذا أعْيَتكم الأمورُ فعليكم بأهل القبور، أوفاستغيثوا بأهل القبور)، جا لەم سۆنگەیەوە (ئالووسیی) -پاش ئەوە كە ڕێدەدا (تەوەسسول) بە پێغەمبەر ﷺ لە حاڵی ژیان و مردندا بكرێت, ئەگەرچی ئەوەی پێ باشە كەهەر بە ناوەكانی خواوەبێ – دەڵێت: زۆرجار خەڵكێك پەنا دەبەنە بەر (ئەولیا)كان، بە مردوویی، یان لە ژیاندا, دەڵێ: (یا سیدی فلانُ أغثني..) بێ شك ئەم جۆرە تەوەسسول و پەنا بردنە بەر، شیاوی موسڵمان نییەو، نابێ نزیكی بكەوێتەوە، بەڵكو گەلێ لە زاناكانمان بە (شیرك)یشیان داناوە، خۆ ئاشكرایە هەركەسێك هاوار لە زیندوویەك (غاییب)، یان لەمردوویەكی نادیار دەكات، وادەزانێ دەسەڵاتی هێنانی خێرو، لادانی شەڕی هەیە! ئەگینا ئەو هاوارە ناكات. **هەق و ڕاستیی ئەمەیە كە:** پێویستە موسڵمان لە هەموو جۆرە شتێكی ئاوا دوور بگرێ و، تەنیاو تەنیا لەخوا هاوار بكات . (تەبەرانیی) دەڵێ: لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ دووڕازییەك -موونافیق- زۆرئازاری موسڵمانەكانی دەدا، ئینجا ئەبوبەكر (خوا لێی ڕازیی بێ) گوتی: بابچین پەنا بەرینە بەر پێغەمبەر ﷺ بەڵكو لەم دووڕووە ڕزگاربین، ئەویش ﷺ فەرمووی: ((إنه لا يُسْتَغاثُ بِي، إنما يُسْتَغاثُ بالله تعالى)) پەنا بەمن نابرێ، بەڵكو هەر خوایە پەنای پێدەبرێ . بێ شك هاوارۆپەنا بردنە بەر گۆڕو گۆڕستان، كارێكە دەبێ خۆمانی لێ دووربگرین، بەتایبەتی خەڵكە بەفام و خاوەن ئاوەزەكان، ئینجا ئەمەش كە بەیناو بەین كابرای پەنابەر موشكیلەكەی جێبەجێ دەبێ، نابێ ببێتە مایەی شەرعییەتدان بەو هاوارو هانایە، چونكە بێگومان ئەو بەدەمەوەهاتنە، (ئیبتلا)و(فیتنە)یە، خۆهەندێ جاریش (شەیتان) خۆی دەكاتە كەسە هاوار بۆ براوەكەو، هاواركەرەكەش بەوشكڵ وسیمای شەیتانە، وادەزانێ ئەوكەسەیە ئەم هانای پێ بردووە، بێ لەوەش بە (كەرامەت)ی دەزانێ بۆی! جابۆ پتر بە ئاگابوون لەم مەسەلەیە، دەتوانی خۆت تەماشایەكی تەفسیری (ئالووسیی) بكەیت.

**سزای دز:**

بەر لەهاتنی دینی ئیسلام، بڕینی دەستی دزو خوێن و(قەسامە)وچەن شتێ تر، باوبوون وهەبوون، هەركەئیسلامیش هات، ئەوانەی گشت سەلماند وهەندێ مەرجی تریشی خستە سەریان، وەكو دەفەرموێ: ﴿٣٨ والسارق والسارقة فاقطعوا أيديهما﴾ دەستی پیاوو ژنی دز، لەتۆڵەی دزیكردندا ببڕن ﴿جزاء بما كسبا نكالا من الله﴾ لەتۆڵەو سزای دزیكردندا، بڕیارێكە لەخواوە دراوە, دەبێ ئەنجامی بدەن، پێغەمبەر دەفەرموێ: ((لَعَنَ الله

السارِقَ يَسْرِقُ الْبَيْضَةَ فَتُقْطَعُ يَدُهُ، ويَسْرِقُ الْحَبْلَ فَتُقْطَعُ يَدُهُ) متفق عليه. یان دەفەرموێ: ((تُقْطَعُ يَدُالسارِقِ فی رُبُع دينارٍفَصَاعِداً)). (بوخاریی)و(موسلیم) ﴿والله عزيز حكيم﴾ وخواش زۆر بەتواناو باڵادەست و، کاربەجێ و کارزانە، هەمووشتێکی پڕ لەحیکمەتە ﴿[39] فمن تاب من بعد ظلمه واصلح﴾ ئینجا کەسێ دوای ستەم و ناهەقییەکەی، پەشیمان بوویەوەو خۆی ڕێك و پێك کردەوە ﴿فإن الله يتوب عليه﴾ بێگومان خواش، تەوبەو گەڕانەوەی لێوەرئەگرێ. (ئیبن عەبباس) و (موجاهید) دەڵێن: پاش ئەوە کە یاسای دەست بڕین درا بەسەریا، خواش تەوبەی لێوەردەگرێ ﴿إن الله غفور رحيم﴾ بەڕاستیی خوا زۆر لێبووردەیە، زۆریش دلۆڤان و میهرەبانە ﴿[40] الم تعلم أن الله له ملك السموات والأرض﴾ ئەرێ تۆ نەتزانیوە کە بەڕاستیی دەسەڵاتداریی و خاوەنداریێتی ئاسمانەکان و زەویی تەنها هی خوایە، هەرچی بکات، دەیکات ﴿يعذب من يشاء ويغفر لمن يشاء﴾ بۆیە خوا خۆی بیەوێ، سزای هەرکەسێك بدات، سزای دەدات، هەرکەسێکیش خۆی مەیلی لێبێ و شیاوبێ، لێی خۆش دەبێ ﴿والله على كل شئ قدير﴾ خواش بەسەر هەمووشتێکدا بەتواناو بەدەسەڵاتە.

سُورَةُ المَائِدَةِ — الجُزْءُ السَّادِسُ

يُرِيدُونَ أَن يَخْرُجُواْ مِنَ ٱلنَّارِ وَمَا هُم بِخَٰرِجِينَ مِنْهَا
وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ﴿٣٧﴾ وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓاْ
أَيْدِيَهُمَا جَزَآءًۢ بِمَا كَسَبَا نَكَٰلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ
﴿٣٨﴾ فَمَن تَابَ مِنۢ بَعْدِ ظُلْمِهِۦ وَأَصْلَحَ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَتُوبُ
عَلَيْهِ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٩﴾ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلْكُ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ وَيَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ
ربع الحزب ١٢ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٤٠﴾ ۞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ
لَا يَحْزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْكُفْرِ مِنَ ٱلَّذِينَ
قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِأَفْوَٰهِهِمْ وَلَمْ تُؤْمِن قُلُوبُهُمْ وَمِنَ ٱلَّذِينَ
هَادُواْ سَمَّٰعُونَ لِلْكَذِبِ سَمَّٰعُونَ لِقَوْمٍ
ءَاخَرِينَ لَمْ يَأْتُوكَ يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ مِنۢ بَعْدِ مَوَاضِعِهِۦ
يَقُولُونَ إِنْ أُوتِيتُمْ هَٰذَا فَخُذُوهُ وَإِن لَّمْ تُؤْتَوْهُ فَٱحْذَرُواْ
وَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ فِتْنَتَهُۥ فَلَن تَمْلِكَ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا
أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَمْ يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يُطَهِّرَ قُلُوبَهُمْ لَهُمْ فِى
ٱلدُّنْيَا خِزْىٌ وَلَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٤١﴾

١١٤ سَمَّٰعُونَ لِلْكَذِبِ

## ڕێنمایەکانی ئایەتی (٣٨-٤٠):

١- تۆڵەی ژن و پیاوی دز: بڕینی دەستی ڕاستییانە، هەتا دەگاتە مەچەکیان، بەومەرجە کە دزراوەکە لەجێی شیاوی خۆیدابووبێ و، ئەمیش بەنهێنی بردبێتی و، نرخیشی ($\frac{1}{4}$)ی دینارێکی زێڕبێ و، دزەکەش باڵغ و ژیربێت، جاپاش دەس بڕینەکە، وەکو: (ترمزیی و، ئەبوداود، نەسایی) ڕیوایەت دەکەن دەسی لەملی هەڵدەبەسترێ، هەرکاتێکیش تەوبە بکاو هەرچی بردووە بیداتەوە، خوا لێی وەردەگرێ.

٢- دز تانەبرێتە لای دادوەر تەوبەی لێوەردەگیردرێ، ئەگەرچی دەستیشی نەبڕدرابێ، بەڵام کە برایە لای حاکم ودادوەر، ئیتر هەردەبێ دەستی ببڕدرێ.

٣- دەبێ مرۆی ئیماندار، بەرامبەر بەبڕیارەکانی خوا، خۆ بەدەستەوە بدا.

٤- بەکۆی دەنگی زانایان ئەر(باوك)شتێ لەماڵی کوڕی بدزێ، دەستی نابڕدرێ، لەبەر فەرموودەی: ((أَنْتَ ومَالُكَ لأبِيكَ))، بۆ پێچەوانەکەیشی، ڕای پەسەند ئەمەیەکە: ئەر کوڕیش لەماڵی بابیا دزیی کرد، دەستی نابڕدرێ.

**هەڵوێستەیەك:** دەبێ لە کۆمەڵگەی ڕاستەقینەی ئیسلامدا، ئەوەندە پێداویستییەکانی ژیانی مرۆڤ جێبەجێ بکرێن، بڕاوبڕ بیر لە دزی نەکاتەوە: ژیانیی و گوزەرانیی و، پەروەردەی دەسەبەر بکرێت، لە دابەشکردنی ئیش و کارو ماڵ و ساماندا، عەداڵەت و دادوەریی ڕەچاو بکرێت، دەبێ لەگەڵ ئەمانەیشدا، خاوەنداریێتی تاکیش (ملكية فردية) لەسەر بنەمای حەلاڵ پەرەی پێبدرێ و، بشکرێتە دەزگایەکی خێر بۆکۆمەڵگا، جائەر ئاوا کرا بۆگشت کەسێك، دڵنیابە ئیتر بیر لەدزیی نامێنێ، خۆئەگەر کەسێکیش پاش ئەوهەموو دەستە بەربوونە دزیی کرد، ئیتر

هەقیەتی دەستی ببڕدرێ، چونکە دزیەکەی تەنیا بۆ دەستدرێژی لە(ئەمن)و ئاسایشی وڵات و کۆمەڵ و کۆمەڵگا بووە، نەك بۆ ژیان و بژێوی، بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا ئەر (شوبهە)و ئیشکالێك هەبوو لەدزییکردنەکەیدا، دەستی نابڕدرێت. بەڵێ.. تاك هەمووکات مافی خۆیەتی بەئارەزووی خۆی بخواو بخواتەوە، جلوبەرگی جوان و قەشەنگی هەبێ، خانووبەرەو باخ و باخاتی هەبێ، جێی حەوانەوەو ئیسراحەتی هەبێ، بەڵێ هەقە کۆمەڵ، یان دەوڵەت - کەجێگری کۆمەڵە- ئەم چەند پێداویستیانە جێبەجێ بکا بۆ تاك ئەگەر توانای کارکردنی هەبوو دەبێ فێری کاری بکەن، دەبێ کاروئامێری کاری بۆ فەراهەم بێنن، خۆئەر نەیدەتوانی کار بکات، جا ئیتر کار نەبوو بیکا، یان ئامێرەکەی نەبوو، یان دەیتوانی کاربکا، بەڵام کار نەبوو بیکا، یان بەشێوەی کاتیی هەبوو، یان بەردەوام هەبوو، بەڵام پێی نەدەژیا، دەبێ لەم ڕێیانەوە ژیانی مسۆگەر بکرێت:

یەکەم: لە ڕێی خێزان و بنەماڵەکەی خۆیەوە، ئەوانەیان، نەفەقەی ئەمیان لەسەرە.

دووەم: لە ڕێی دەسەلاتدارانی گەڕەکەوە.

سێ یەم: لە (بیت المال) بەشێ زەکاتی دەدرێتێ، جائەگەر بە زەکاتەکە نەدەژیا، ئەوسا دەوڵەت ژیانی ئەوخەڵکە هەژارە دەخاتە سەرشانی دەوڵەمەندەکان.

جائەگەر ئاوا بەدەم هەژارو بێ نەواوە بچین، کێ دزی دەکا؟ خۆئەگەر لەوحاڵەتەشدا هێشتا هەر دزیی کرد، دیارە لەبەر برسییەتی نەبووە، بەڵکو بۆ پێکەوەنانی ماڵ و سامانە لەرێگەی ناشەرعییەوە، ئیسلامیش رێگە بەکەس نادا لە خت و خۆرایی ئاسایشی کۆمەڵگە بخاتە خەتەرو ترس و لەرزەوە، ماڵ و سامانی ئەم و ئەو فەرهوود بکات.

هەموو تاکێك لەکۆمەڵگەی ئاوادا، هەقیەتی لەڕێی حەڵاڵەوە (نەك لەڕێی سوود خواردن و گزیی و دەسبەسەراگرتن و (ئیحتیکار) و، خواردنی کرێ و مزەی کرێکاران) ماڵ وسامان پێکەوە بنێ، جائەگەر کەسێ دزی کرد "پاش ئەوە بەشی خۆی ژیانی بۆ مسۆگەر کرا"، دیارە هیچ برووبیانوویەکی شەرعیی نییەو، دەبێ جەزرەبەو تۆڵە بدرێ.

بەڵام ئەگەر بیانوویەکی شەرعیی هەبوو، وەیان لەوماڵەدا دزیویەتی شوبهەیەك هەبوو، لەحاڵەتی ئاوادا یاسای ((إدْرَأُوا الْحُدُودَ بالشُّبُهَات)) دێتە پێش. بۆیە (عومەر - د.خ) لە وشکەساڵیەکەدا دەستی دزی نەدەبڕی، وەیان ئەوکاتە خولامەکانی (ئیبن حاتب) لەپیاوێکی هۆزی (موزەنیە) وشترێکیان دزیی، پاش لێکۆڵینەوە لەهۆی دزیکردنەکە، دەرکەوت کە لەلایەن (ئاغا)کەیەوە برسیکراون، بۆیە دزییان کردووە! ئیتر دەستی نەبڕین و، وشترەکانیشی بەئاغاکەیان بژارد، بۆئەوە ژیر ببێ و جارێکی تر خولامەکان برسی نەکا.

شەریعەتی ئیسلام بەرلە تۆڵە وەرگرتن، هەموو رێگەیەکی (ویقایە) و خۆپاراستن دەگرێتە بەرو، برووبیانووی کەس ناهێڵێت بۆتاوان کردن، پاشان ئەر تاوانێك روویدا، تەنیا تۆڵەی تاوانبارەکە دەدات، ئەوانەی هەر بەناهەق تەماح دەکەنە سەروماڵ وحاڵی خەڵکی. ماڵێکیش کە دەدزرێ ودەستی دزیی لەسەر دەبڕێ، دەبێ لەجێی مەحکەم وشیاوی خۆیدا دانرابێ، بەنهێنی و پەنامەکی برابێت، نرخ و بەهایەکیشی هەبێ، وەکو لای زاناکان بڕیارە، چواریەکی دینارێکی زێڕ بێ.. کەوابوو ئەرکەسێ ماڵی لادانراو، دزی لێکرد، یان خولامێك (خزمەتکارێك) کە ڕێی پێدراوە بەناوماڵدا دێت و دەچێ شتێکی دزی، دەستیان نابڕێت، یان ئەگەر بەرووبوو لەکێڵگەدا، یان پێش ئەوە بخرێتە خەرمانەوە دزرا، دەستی دزەکەی نابڕدرێ.. وە..وە، بەدەر لەوانەش دەبێ ماڵەکە بەشی دزەکەی پێوەنەبێ،

کەوابوو ئەگەر لەهاوشەریکی خۆی دزییکرد، یان لە(بیت المال) دزییکرد، دەستی نابڕیٚ، بەڵکو باسی (تەعزیر)و سەرزەنشت دێتە پێش، بە قامچیی و شەلاق، یان بەندیخانەو زیندان، یان ئامۆژگاریی ژێر دەکرێت، وە یان هەرکەس بەپێی حاڵی خۆی، دادوەر جۆرە تەعزیرێکی دەکات، بەڵیٚ.. ئەم گومان و(شوبە)انە، وەکو برسیەتیی و ئاتاج و موتاجیی و، شەریکیی و هاوبەشیی و، پێلێنەر (موعتەریف) لە ئیعترافەکەی پەشیمان بێتەوە، یان شایەتەکان نکووڵی بکەن، هەریەك لەمانە ریٚ بەدەست بڕین دەگرن . (فوقەها) و پێشەواکانیشمان گەلێ شتیان بە شیبهە داناوەو ریٚ لە دەستبڕین دەگرن، بۆنموونە: هەر شتێك لەبنەڕەتدا حەلاڵ بیٚ و ماڵی گشتیی بیٚ، وەکو کانیاوو دەریاو ئاوەکان، یان ڕاوو نێچیرکوشتن، بەلای (ئەبوحەنیفە)وە دەبێتە شیبهەو ، ریٚ لە دەستبڕین دەگرێت، کۆمپانیا گشتییەکانیش هەروا، دیسان دزینی ئەوشتانە کە زوو فاسیدو خراپ دەبن، وەکو هەندیٚ خۆراك و، میوەو سەوزەجات و گۆشت و نان و هەرشتێکی تر لەوبابەتە.

**خوێنەری هێژا!** ئەم چەند نموونەیە بۆ سەماحەتی ئیسلام و، ڕێگرتن لە بڕینی دەستی دز بە شیبهەو گومان بەسە، پێغەمبەریش ﷺ دەفەرمویٚ: ((إِدْرَءُوا ا لْحُدُودَ بالشُّبُهَاتِ)). عومەری کوری خەتابیش (د.خ) دەڵیٚ: (لأن أعطل الحدود بالشبهات أحب إلي من أن أقيمها بالشبهات). بیٚ شك بەدانانی تۆڵەی دەستبڕین، شەریعەتی ئیسلام دەتوانیٚ هۆ نەفسییەکانی دزیی ڕیشەکەن بکات، پاش ئەوە کە هەموو رێیەکی لەدزی گرت.. دیارە کە بڕینی دەستی دز، لەسەر ئەم بنەمایە دانراوە، نەك هەرکەسیٚ دزییکرد، بیانووی ببیٚ، یان نەیبیٚ دەستی بڕێت، ئاشکرایشە تەنیا چارەسەرێك بۆ کاری دزێویی دزیی، هەرئەو تۆڵەی دەست بڕینەیە، هەرئەوەیە دەتوانیٚ وای لێبکات کەجارێکی تر بیر لەماڵ و سامانیی کەسێکی تر نەکاتەوەو، هەمیشەش چاوی لەدەستی خۆیەتی و دەزانیٚ بۆچی بڕاوە ، بەلاّم زیندانیی کە یاساکانی ئەمڕۆ هەڵیانبژاردووەو پەسەندیان کردووە، بیٚ سۆ ئەو دۆزە نابینیٚ و، هەر ئەوەندەیە کە دزەکە بۆماوەیەك لە ئیش وکار ڕاگیراوەو، هەرکە ئازاد بوو دەگەڕێتەوە سەرکارەکەی خۆی، لە جارانیش زیاتر.

**لەبەر کرداری جوولەکە دڵت تەنگ مەکە:**

پیاوێکی جوولەکە لەگەڵ ژنە جوولەکەیەکدا کاری ناشەرعییان کردبوو ، پاشان وتیان: بچنە لای موحەممەد بپرسن: جائەگەر ئەو لەتۆڵەیدا بڕیاری شەلاقییدا، ئەوا بە گوێی بکەن، ئەگینا هەرچی دەڵیٚ گوێی مەدەنیٚ، ئەوسا "وەکو بوخاریی وموسلیم" دەڵێن، ئایەتی: (یاأیها الرسول لا یحزنك..) هاتە خواریٚ. (موسلیم و ئەبوداودو پێشەوا ئەحمەد)یش دەڵێن: جوولەکەکان تۆڵەی زیناکار "کە (بەردەباران) بوو" گۆڕییان بە شەلاق لێدان و ڕوورەشکردن، جا هاتن لە پەیامبەریان ﷺ پرسی: ئاخۆ حوکمی زیناکار چییە؟ بەومەبەستە کە پەیامبەریش ﷺ لەسەر ئەوەکە ئەوان پێیانخۆشە ئەریٚ بکا، ئەویش فەرمووی:((اللهم إني أولُ مَنْ أَحْيَا أمركَ إذ أمَاتُوهُ))، ئیتر فەرمانی بە بەردەباران دا, خوای گەورەش ئایەتی (یاأیهاالرسول لایحزنك الذین) هەتا ئایەتی (٤٥)ی ناردو فەرمووی: ﴿[٤١] یاأیهاالرسول لا یحزنك الذین یسارعون فی الکفر﴾ ئەی پەیامبەری خوا! ﷺ ئەوکەسانە دڵ تەنگت نەکەن، لە بیٚ باوەڕیدا تیژڕەویی و پێشڕەوی دەکەن وراو بۆچوونی خۆیان دەخەنە بەر بڕیارو فەرمانی خواوە ﴿من الذین قالوا آمنا بأفواهم﴾ ئەوانەیان بەدەم و زمان دەڵێن: بڕوامان هێناوە ﴿ولم تؤمن قلوبهم﴾ کەچی بەدڵ بڕوایان نەهێناوە ﴿ومن الذین هادوا﴾ و ئەوانەشیان بوونەتە جوولەکەو هەردەم ﴿سماعون للکذب﴾ گوێ بۆ درۆ هەڵدەخەن و، کاری پێدەکەن ﴿سماعون لقوم آخرین لم یأتوك﴾ گوێ بۆ کەسانێکی تری جاسوس و خوانەناس دەگرن کە: هێمان نەهاتوونەتە لای تۆ، وەك جوولەکەکانی (خەیبەر) و (فەدەك) لەباتی ئەوە کە گوێ بۆتۆ بگرن، کەچی گوێیان

بۆخەڵکی تر دەگرت و، بەبڕیاری ئەوان ڕەفتاریان دەکردو قسەی تۆشیان دەبردە لای ئەوان ﴿یحرفون الکلم من بعد مواضعه﴾ وشەو بڕیارەکانی خوا لەجێگەی خۆیدا دەگۆڕن، ئەوەبوو بەردەبارانی زیناکاریان بە قامچی لێدان گۆڕی! ﴿یقولون إن أوتیتم هذا فخذوه﴾ دەڵێن: بچن لە محمد ﷺ بپرسن : جائەگەر وەك ئەوەی خۆمان بڕیارییدا، واتە: قامچی لەباتی بەردەباران، ئەوا لێی وەرگرن وبە گوێی بکەن ﴿وإن لم تؤتوه فاحذروا﴾ خۆئەگەر ئەو بڕیارەی خۆمانی نەدا، وشیاربن و خۆتانی لێ بپارێزن و بەگوێی مەکەن ﴿ومن یردالله فتنته﴾ هەرکەسێ خوا بیەوێ بەسەختی تاقی بکاتەوەو گومڕای بکات ﴿فلن تملك له من الله شیئا﴾ هەرگیز تۆ ناتوانی لەخواوە شتێکی بۆبکەیت و، لەو جەزرەبەیە ڕزگاری بکەیت ﴿أولئك الذین لم یردالله أن یطهر قلوبهم﴾ ئەمانە خەڵکانێکن خوانایەوێ لەچڵك و

الجزء السادس — سورة المائدة

سَمَّٰعُونَ لِلۡكَذِبِ أَكَّٰلُونَ لِلسُّحۡتِۚ فَإِن جَآءُوكَ
فَٱحۡكُم بَيۡنَهُمۡ أَوۡ أَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡۖ وَإِن تُعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ فَلَن
يَضُرُّوكَ شَيۡـٔٗاۖ وَإِنۡ حَكَمۡتَ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِٱلۡقِسۡطِۚ
إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ ٤٢ وَكَيۡفَ يُحَكِّمُونَكَ وَعِندَهُمُ
ٱلتَّوۡرَىٰةُ فِيهَا حُكۡمُ ٱللَّهِ ثُمَّ يَتَوَلَّوۡنَ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَۚ
وَمَآ أُوْلَٰٓئِكَ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٤٣ إِنَّآ أَنزَلۡنَا ٱلتَّوۡرَىٰةَ فِيهَا
هُدٗى وَنُورٞۚ يَحۡكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسۡلَمُواْ لِلَّذِينَ
هَادُواْ وَٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلۡأَحۡبَارُ بِمَا ٱسۡتُحۡفِظُواْ مِن كِتَٰبِ
ٱللَّهِ وَكَانُواْ عَلَيۡهِ شُهَدَآءَۚ فَلَا تَخۡشَوُاْ ٱلنَّاسَ
وَٱخۡشَوۡنِ وَلَا تَشۡتَرُواْ بِـَٔايَٰتِي ثَمَنٗا قَلِيلٗاۚ وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم
بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ٤٤ وَكَتَبۡنَا عَلَيۡهِمۡ
فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفۡسَ بِٱلنَّفۡسِ وَٱلۡعَيۡنَ بِٱلۡعَيۡنِ وَٱلۡأَنفَ
بِٱلۡأَنفِ وَٱلۡأُذُنَ بِٱلۡأُذُنِ وَٱلسِّنَّ بِٱلسِّنِّ وَٱلۡجُرُوحَ
قِصَاصٞۚ فَمَن تَصَدَّقَ بِهِۦ فَهُوَ كَفَّارَةٞ لَّهُۥۚ وَمَن
لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ٤٥

١١٥

چەپەڵی و شیرك ، دڵیان پاك بکاتەوە ﴿لهم فی الدنیا خزی﴾ بەشیان لەم جیهانەدا ڕیسواییە ﴿ولهم فی الآخرة عذاب عظیم﴾ لەدواڕۆژیشدا سزایەکی زۆر سەخت و گەورەیان هەیە ﴿[42] سماعون للکذب﴾ هەمیشە بۆ درۆو پڕوپاڵانتەو قسەی نادروست گوێ هەڵدەخەن ﴿اکالون للسحت﴾ حەرامخۆر و بەرتیل خۆرن ﴿فإن جاؤك﴾ جائەگەر جارێ بۆ بڕیارو داوەریی کێشەکانیان هاتنە لای تۆ ﴿فاحکم بینهم او أعرض عنهم﴾ ئارەزووتە لەنێوانیاندا داوەریی بکەیت، یان ڕوویان لێوەربگێڕی و گوێیان نەدەیتێ، چونکە بەدڵ نەهاتوونەتە لات و ڕاست ناکەن ﴿وإن تعرض عنهم﴾ خۆئەگەر ڕوویان لێ وەربگێڕی و داوەرییان نەکەیت ﴿فلن یضروك شیئا﴾ هەرگیز ناتوانن هیچ زیانێکت پێبگەیەنن (ئیبن عەباس، موجاهید، عیکرەمە، حەسەن، سوددی، زەیدی ئیبن ئەسلەم، عەتای خوراسانی و..هتد) دەڵێن: ئەو ئایەتەی: (فإن جاؤك..) بەئایەتی: (وأن احکم بینهم بما أنزل الله) سڕاوەتەوەو دەبێ تەنیا بەقورئان داوەرییان بکات ﴿وإن حکمت فاحکم بینهم بالقسط﴾ خۆئەگەر داوەریشت کرد لەنێوانیاندا، دەبێ بەدادگەرانە بێت ﴿إن الله یحب المقسطین﴾ بەڕاستیی خوا خەڵکانی دادپەروەر و، دادگەری خۆش دەوێ ﴿[43] وکیف یحکمونك﴾ سەیرە ئەوانە دێنە لات و، دەیانەوێ تۆ بکەنە دادوەر بۆ کێشەکانیان ﴿وعندهم التوراة فیها حکم الله﴾ وخۆشیان (تەورات) یان لایەو بەروونی حوکم و بڕیاری خوای تێدایەو کاریشی پێناکەن، واتە: هاتنەکەیان بۆ لای تۆ ڕاست نییە ﴿ثم یتولون من بعد ذلك﴾ دێن بۆداوەریی، کەچی دوای داوەرییەکەی تۆ پشت هەڵدەکەن و ڕازیی نابن و ڕوو وەردەگێڕن ﴿وما أولئك بالمؤمنین﴾ دیارە ئەوانە هەر بڕوادار نین، نە بەتۆ، نەبە تەوراتەکەی خۆشیان.

## ڕێنماییەکانی ئایەتی (٤١-٤٣):

١- خەم وخەفەت نەخواردن بۆقسەی ناپەسەندی کافرو خوانەناسان، کارێکی شەرعیی و سوننەتە.

٢- گوێ گرتن بۆ درۆ لەبەر ناچاری نەبێ کارێکی حەرامە.

٣- گۆڕینی بڕیارو (کەلام)ی خوا ، قەدەغەو حەرامە.

٤- داوەر دەتوانێ لەنێوان خاوەن نامەکاندا داوەریی بکا، دەشتوانێ بیان نێرێ بۆلای زاناکانی خۆیان.

٥- دادگەری و یەکسانی و بێ لایەنگری لەحوکمدا پێویستە، ئەگەرچی بریار بۆ دراوەکەش ناموسڵمان بێ.

٦- ددان نان بە کوفری (جوولەکە)دا، چونکە زاناکان دەڵێن: هەرکەسێ شوێنی حوکمی غەیری خوا کەوێ کافر دەبێ ، خۆ دیارە جوولەکەیش ئەوە حاڵیانە. سەیرو سەمەرە لەوەدایە کە زۆربەی موسڵمانی ئەمڕۆش هەر بەیاسای ئەم لاو ئەولا کاردەکەن!.

**کارکردن دژی فەرمانی خوا، لەدین وەرگەڕانە :**

﴿[٤٤] إنا أنزلنا التوراة فیها هدی و نور﴾ ئێمە تەوراتمان نارده خوارێ، بێ شك بۆ هەموو خێروچاکەیەك، ڕێنمایی و ڕووناکایی تێدایە ﴿یحکم بها النبیون الذین أسلموا للذین هادوا﴾ هەموو ئەو پەیامبەرانەی (بەنی ئیسرائیل) -کە بەرفەرمان وملکەچی بڕیاری خوابوون- هەر بەو تەوراتە داوەریی مووسایییەکانیان دەکرد، واتە: ئێستا جوولەکە لەرێی راست لایانداوە ﴿والربانیون والأحبار﴾ و زانا خواناس و شەرعزانەکانیشیان هەروا ﴿بما استحفظوا من کتاب الله﴾ و ئەوانەش کە پارێزگاری تەوراتیان پێ سپێررا بوو پاش نەوەی یەکەم کەنەهێڵن تێکەو لێکە بکرێ ﴿وکانوا علیه شهداء﴾ و شایەتیش بوون لەسەری ودەیانزانی راست و هەقە، نەك وەکو ئێوە ئەی یەهوودی سەردەم! کە تەوراتتان گۆڕی و حوکمتان پێنەکرد! ﴿فلا تخشوا الناس واخشون﴾ کەوابوو لەمەردم مەترسن، بەڵکو دەبێ تەنها لەمن بترسن و، بەرفەرمانم بن ﴿ولا تشتروا بآیاتی ثمنا قلیلا﴾ ئایەت و نیشانەکانی من بەبەهایەکی زۆر کەم مەفرۆشن، هەق مەشارنەوە و کیتمانی مەکەن، خوا چۆن فەرمان دەدا، ملراکێشن وتەسلیم بن ﴿ومن لم یحکم بما أنزل الله فأولئك هم الکافرون﴾ هەرکەسێك بەو کتێب وبەرنامە خوا ناردوویەتی حوکم و بڕیار نەدات، ئیتر لەبەرئەوە بێ کە بەکەم و کورتیی بزانێ، یان هەر بڕوای پێ نەبێ، وە یان لەبەر هەر هۆیەکی تربێ، دیارە هەرکەسێکی وا لەوکافرو بێ باوەڕانە لەچوارچێوەی دینی خوا دەچێتە دەرێ. (شێخ حەسەنی بەصریی) دەڵێت: ئەم ئایەتی (ومن لم یحکم بما انزل الله) ئەگەرچی دەربارەی جولەکە هاتبێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا گشتگیرەو، هەموو موسڵمانان و خاوەن دینێك دەگرێتەوە. (عەلی کوڕی ئەبی تەڵحە)ش لە (ئیبن عەباس)ـەوە دەڵێ: ئایەتی: (ومن لم یحکم بما انزل الله فأولئك هم الکافرون) مانای ئەوەیە کە: هەرکەسێ ئینکاری و نکووڵی هەرشتێ لە(ما انزل الله) بکا، پێی کافر دەبێت، بەڵام ئەوکەسە کەباوەڕی پێدەکاو، حوکمیشی پێناکا، دەبێتە پیاوێکی ناهەقیکارو فاسیق/ ئیبن جەریری تەبەریی. (ئیبن تاوس)یش دەڵێ: (ولیس کمن یکفر بالله و ملائکته و کتبه و رسله. و قال الثوری: من ابن جریج عن عطاء قال: کفرٌ دون کفر ، ظلم دون ظلم، وفسق دون فسق (ئیبن جەریر) واتە: ئەوکەسە کە باوەڕی بەشەریعەتی ئیسلام هەیەو، بەڵام لەبەر هەر هۆیەك بێت، حوکمی پێناکات، ئەمە وەکو ئەوە نییە کەباوەڕی بەخواو بەفریشتەو، بە کتێب و پێغەمبەرەکان نەبێ. (سەوری)یش دەڵێ: ئەوجۆرە کەسانە، جۆرە کافرێکن وکافری تەواو نین. گەلێ لەزاناکان دەڵێن: ئەمە مانای ئەوەیە کە ئەر پیاوێك ژنێکی کوشت، لەباتیدا دەکوژرێتەوە، بەبەڵگەی ئەم فەرموودانەش: ((إنّ الرّجُلَ یُقْتَلُ بالمرأة)) نەسایی. یان ئەم فەرمووده: ((المُسْلِمُونَ تَتَکَافَأُ دِمَاؤُهُم)).

## تۆڵەی چاوو لووت و گوێ و، هەر زەخمێکی تر:

﴿[٤٥] وكتبنا عليهم فيها﴾ ئێمە لەتەوراتدا لەسەر (بەنی ئیسرائیل)مان نووسیی و بڕیارماندا ﴿ان النفس بالنفس﴾ کە تۆڵەی کوشتنی گیانێك، گیانێکە، واتە: ئەرکەسێك کوژرا، تەنها بکوژەکەی دەکوژرێتەوەو، نابێ دەس بۆکەسێکی تر ببرێت ﴿والعين بالعين﴾ وچاو لەباتی چاو ﴿والأنف بالأنف﴾ و لووت لەباتی لووت ﴿والأذن بالأذن﴾ و گوێ لەباتی گوێ ﴿والسن بالسن﴾ و ددان لەجیاتی ددان ﴿والجروح قصاص﴾ و هەموو زام و برینێکیش، بەگوێرەی خۆی قیساس و تۆڵەی هەیە، کەچی لەگەڵ ئەو بڕیارەدا، هێمان هەرسەرپێچیان کردو، بۆخەڵکی خۆیان ئامادەبوون، تۆڵە بکەنەوە، بەڵام بۆ دانەوەی هەقی خەڵکی تر، لارو لاساربوون و، گەلێ لەبڕیارەکانی خوایان گۆڕی!

﴿فمن تصدق به﴾ جاهەرکەسێ لە کابرای تاوانبار خۆش بوو و بەخشیی و کردیە خێر ﴿فهو كفارة له﴾ ئەوکارەیە دەبێتە کەفارەت و سڕینەوەی گوناحەکانی و، خواش لەو خۆش دەبێ ﴿ومن لم يحكم بما انزل الله﴾ و هەرکەسێك بەپێی ئەو بەرنامەیە خوا ناردوویەتی داوەریی و بڕیارنەدات ﴿فأولئك هم الظالمون﴾ بێ سۆ لە ڕیزی ستەمکاران وسنووردەرچووان دەبن.

### عیساو ئینجیلەکەی:

﴿[٤٦] وقفينا على آثارهم بعيسى ابن مريم﴾ بەدوای پێغەمبەرەکانی (بەنی ئیسرائیل)دا عیسای کوڕی مەریەمیشمان نارد ﴿مصدقا لما بين يديه من التوراة﴾ کە باوەڕی بەو تەوراتە هەبوو، بەر لەخۆی هاتبوو ﴿وآتيناه الإنجيل فيه هدى و نور﴾ و (ئینجیل)یشمان دایە کە رینمایی و ڕووناکیی تێدابوو ﴿مصدقا لما بين يديه من التوراة﴾ وتەسدیقی (تەورات)یشی دەکرد ﴿و هدى و موعظة للمتقين﴾ بۆ خواناسان و خۆپارێزان ڕێنماو ئامۆژگاری بوو، واتە: پاش ئەوانە ئیتر هەقبوو لەخراپەو خراپەکاری سڵ بکەنەوە ﴿[٤٧] وليحكم اهل الإنجيل بما انزل الله فيه﴾ وە شوێنکەوتووانی (ئینجیل)یش، دەبێ هەربەپێی ئەو ڕێنماییانە خوا تێیدا دایبەزاندوون بڕیار بدەن، واتە: بڕوایان بەهەمووی هەبێ و، حوکم بەهەموویشی بکەن ﴿ومن لم يحكم بما انزل الله فأولئك هم الفاسقون﴾ و ئەوکەسانەش بەوبەرنامە -خوا ناردوویەتی- بڕیارو حوکم نەدەن، دیارە یاخیی و ناپاك و لەسنوور دەرچوون.

بەڵێ.. خوامان تاك وتەنیایە، بەدیهێنەرو دروستکەرمان تاك و تەنیایە، پاشاو خاوەنمان تاك وتەنیایە، کەوابوو دەبێ حاکم و دادوەریشمان (واتە: شەریعەتی ئیسلام) تاك و تەنیابێ، دانەری حوکم و ئەحکام، هەردەبێ تاك و تەنیابێ، وە هەرخواش مافی لابردن و گۆڕینی بڕگەو ماددەیەکی هەیە، دەبێ لەیەك شەریعەتیش پەیڕەوی بکرێ،

الجزء السادس — سورة المائدة

وَقَفَّيْنَا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم بِعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ
ٱلتَّوْرَىٰةِ ۖ وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْإِنجِيلَ فِيهِ هُدًى وَنُورٌ وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ
يَدَيْهِ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٤٦﴾ وَلْيَحْكُمْ
أَهْلُ ٱلْإِنجِيلِ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فِيهِ ۚ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ
ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٤٧﴾ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ
بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَمُهَيْمِنًا
عَلَيْهِ ۖ فَٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ
عَمَّا جَآءَكَ مِنَ ٱلْحَقِّ ۚ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ۚ
وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَكُمْ فِى مَآ
ءَاتَىٰكُمْ ۖ فَٱسْتَبِقُوا۟ ٱلْخَيْرَٰتِ ۚ إِلَى ٱللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا
فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿٤٨﴾ وَأَنِ ٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ
أَنزَلَ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ وَٱحْذَرْهُمْ أَن يَفْتِنُوكَ عَنۢ
بَعْضِ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ ۖ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَٱعْلَمْ أَنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُصِيبَهُم
بِبَعْضِ ذُنُوبِهِمْ ۗ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ لَفَٰسِقُونَ ﴿٤٩﴾ أَفَحُكْمَ
ٱلْجَٰهِلِيَّةِ يَبْغُونَ ۚ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴿٥٠﴾

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ — ١١٦

بێگومان قەبووڵکردنی ئیسلامێکی ئاوا، لای خوا پەسەندەو بەدینداری دادەنرێت، پێچەوانەی ئەمەو حوکم بە غەیری (ما أنزل الله)..(کوفرو زوڵم وفیسقە).

رێنماییەکانی ئایەتی (٤٤-٤٧):

١- دەبێ هەر لەخوا بترسین و، هەر فەرمانەکانی ئەویش جێبەجێ بکەین، ئینکاری یاساکانی خواو، حوکم پێ نەکردنیان و، سووکایەتی پێکردنیان و پەسەندکردنی هەندێکی و پشتگوێ خستنی هەندێکی تری، بێ شك کوفرە.

٢- تۆڵەو (قیساس) و خوێن لە نەفس و، لە برین و زەخمەکاندا واجیبە، بۆ نموونە: هەردوو چاو خوێنی تەواوی دەکەوێ، یەك چاوی ساغ نیو خوێن، لووت خوێنی تەواو، هەردوو گوێ خوێنی تەواو، یەك ددان پێنج وشتر، هەردوو لێو خوێنی تەواو ، زمان خوینی تەواو.

٣- زیادەڕەوی لەتۆڵەدا -دووکەس لەباتی یەك کەس، یالەباتی بکوژەکە خزمێکی بکوژرێتەوە- کارێکی حەرامە لەکتێبی (ئینجیل)یشدا تۆڵە و قیساس هەر هەبووە، کەوابوو ئێوەش - عیسایی و مووسایی- کار بەوبڕیارانە بکەن.

**هەر بەقورئان بڕیار بدە:**

پاش باسکردنی (تەورات) دێتە سەرباسی قورئان و، رایدەگەیەنێت کەدەبێ تەنیا بەوحوکم و بڕیار بدەن، بۆیە دەفەرموێ: ﴿[٤٨] و انزلنا إليك الكتاب بالحق﴾ ئەم کتێبەی (قورئان)یشمان، هاوڕێ لەگەڵ هەموو ڕاستییەکدا ناردە خوارێ بۆت ﴿مصدقا لما بين يديه من الكتاب﴾ تەسدیقی ئەو کتێبانەش دەکات بەرلەخۆی هاتوون ﴿و مهيمنا عليه﴾ و چاودێرو پارێزەرو شایەتیشە بۆیان، ئەمینداری هەموو کتێبەکانی بەر لەخۆیەتی، ئەم هەر شتێکی بەراست، یان ناراست دانا، هەر ئەوەیە ﴿فاحكم بينهم بما انزل الله﴾ دەسا تۆش لەنێوان گشت خەڵکاندا، تەنانەتی جوولەکەو گاورەکانیش هەر بەپێی ئەوبەرنامەیە کاربکەو بڕیاربدە، خوا ناردوویە ﴿ولا تتبع أهواءهم عما جاءك من الحق﴾ ولەو هەق و راستییە لەخواوە بۆت هاتووە لامەدەو، مەکەوە شوێنی هەواو ئارەزوویان ﴿لكل جعلنا منكم شرعة ومنهاجا﴾ بۆ هەریەکێ لەئێوەش ئەی موسڵمانان و ئەهلی کیتاب! یاساو بەرنامەیەکمان دانا، بۆئەوە کاری پێبکەن و لێی لانەدەن، واتە: پلە بەپلە بەدوای یەکدا کتێب وبەرنامەمان بۆناردن، هەتا کۆتا بەرنامە (قورئانی پیرۆز) ئیتر پاش هاتنی ئەو، دەبێ هەموو لەدەوریا خڕ ببنەوەو، کار هەربەو بکەن ﴿ولوشاء الله لجعلكم أمة واحدة﴾ خۆئەگەر خوا ویستبای هەمووتانی دەکردە یەك گەل و یەك و ئوممەت و، هەرلەسەرەتاوە یەك بەرنامەشی بۆ دادەنان ﴿ولكن ليبلوكم فيما آتاكم﴾ بەڵام بەوشتانە پێمانداون ویستی تاقیتان بکاتەوە، تادەرکەوێ کێ گوێڕایەڵە، کێش سەرپێچی دەکا، ئەمرۆ دین و ئایینێکە، سبەینێ شەریعەت و بەرنامەیەکە، هەتا دەرکەوێ کامتان بەئاسانی و بێ چەندوچۆن تەسلیم دەبێ و بەرفەرمانە ﴿فاستبقوا الخيرات﴾ کەوابوو گشتتان پێشبڕکێ بکەن، بۆئەنجامدانی هەموو کارێکی چاکەوخێر ﴿إلى الله مرجعكم جميعا﴾ دڵنیاشبن هەموو هەر بۆلای خوا دەگەڕێنەوە ﴿فينبئكم بما كنتم فيه تختلفون﴾ ئەوساش زۆر بەوردی لەوشتانە ئاگادارتان دەکا، ناکۆکی و کێشەتان بوو، پاشانیش هەرکەسە بەپێی کاروکردەوەی خۆی، پاداش و تۆڵە وەردەگرێت.

**بەقورئان کێشەی مەردم بخەملێنە:**

﴿[٤٩] وأن احكم بينهم بما انزل الله﴾ دیسان دەبێ هەر بەوبەرنامە لەناوجوولەکە وگاورو خەڵکانی تریشدا ، حوکم وبڕیار بدەیت، خوا ناردوویە ﴿ولا تتبع أهواءهم﴾ نابێ شوێنی هەواو ئارەزووی ئەوانە بکەوی و، چەواشەت

بکەن. (ئیبن عەباس) دەڵێ: تاقمێ لەزانایانی یەهوود وەك (ئیبن سوریا، کەعب ، شاس) خڕ بوونەوەو گوتیان: با بچینە لای موحەممەد ﷺ، بەڵکو بتوانین لەخشتەی بەرین و فریوی بدەین، چونکە خۆئەویش هەر وەك ئێمە ئادەمییە، بچین پێی بڵێین کە: لە فلانە مەسەلەدا پشتگیری لەئێمە بکە، ئەوسا ئێمەیش لەهەندێ شتا پەیڕەوی لەتۆ دەکەین، دیارە خۆیشت چاك دەزانی کە: ئەر ئێمە شوێنت کەوین، هۆزەکانی تریش چاومان لێدەکەن، بەڵێ هەستان و چوونە لایی و، مەبەستەکانیان لا درکان، بەڵام ئەو بەهیچ شێوەیەك بەگوێی نەکردن و، نەیانتوانی لەڕێی ڕاست بیترازێنن، ئینجا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوەو فەرمووی: ﴿واحذرهم أن يفتنوك عن بعض مانزل الله إليك﴾ هۆشیاربە! لەو ڕێنمایانەی خوا بۆی ناردوی، لاڕێت نەکەن وکلا نەبیت ﴿فإن تولوا﴾ ئینجا ئەگەر لە داوەریی و بڕیاری تۆ، ڕوویان وەرگێڕاو، نەهاتنە سەرنەخشەی تۆ ﴿فاعلم انما يريدالله أن يصيبهم ببعض ذنوبهم﴾ چاك بزانە کە: خوا دەیەوێ -بەهۆی تاوانەکانیانەوە- تۆڵەیان لێ بسێنێت ﴿وإن كثيرا من الناس لفاسقون﴾ خۆ بێگومان زۆرینەی خەڵك لەڕێ دەرچوون و لایانداوە.

**دابی جاهیلییەتی بەر لەئیسلام مەهێننەوە:**

﴿٥٠ افحكم الجاهلية يبغون﴾ ئاخۆ ئەمانە دەیانەوێ، داب و یاسای جاهیلیەتی بەر لە ئیسلام زیندوبکەنەوە و بڕیارو حوکمی خوا، وەلانێن وەك ئەوان؟! ﴿ومن احسن من الله حكما﴾ جا دەبێ بڕیارو حوکمی کێ جوانترو باشتر بێت ، لەحوکم و فەرمانی خوا ﴿لقوم يوقنون﴾ بۆئەوانە کە هیچ شك و گومانێکیان نییەو، ئەهلی یەقینن؟ چونکە هەرئەمانە چاك دەزانن کە شەریعەتی ئیسلام لەهەموو بەرنامەکانی تر گونجاوترە بکرێتە دەستوورو سەرچاوەی دەستوور، بێ دین و لادەرەکان نازانن و تێناگەن، ئامادەش نابن تێبگەن!. (تەتار)ـەکان بەیاساکەی (جەنگیزخان) کاریان دەکرد! کە پێك هاتبوو لە چەند فەرمان و بڕیارێکی تێکەڵ لەدینی ئیسلام و جوولەکەو گاور، هاوڕێ لەگەڵ هەندێ ڕاووبۆچوونی خۆشی، پاشان چینی پاش ئەوان کەهاتن پەیڕەوییان لێکردو فەزڵیاندا بەسەر شەریعەتی خوادا! دیارە کاری ئاوا، دەرچوونە لەئیسلام و، مرۆڤی پێ کافر دەبێ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((أَبْغَضُ النـاسِ إلى الله ﷻ مَنْ يَبْتَغِـي فـي الإسلام سُنَّةَ الجاهليـةِ، و طَالـبَ دمَ امـرئٍ بغير حق، لِيُرِيـقَ دَمَـهُ)) تەبەریی. کەوابوو زۆر پێویستە کە: موسڵمانان بەتایبەتی حکومەت ودەوڵەتەکان بگەڕێنەوە بۆلای بەرنامە پیرۆزەکەی ئیسلام و، هەر ئەویش بکەنە یاساو دەستوور بۆ ولات

**ڕێنماییەکانی ئایەتی (٤٨-٥٠):**

١- دەبێ لە هەمووشتێکدا هەر بەقورئان و سووننەت، حوکم و بڕیار بدرێت، نابێ هیچ شەریعەت و بەرنامەیەکی تر، بکرێ بە یاساو بەرنامەو حوکم و بڕیاری پێ بدرێ.

٢- نابێ پەیڕەوی لە هەواو ئارەزوی خەڵکی بکرێ.

٣- حیکمەتی جیاوازیی نێوان شەریعەتە ئاسمانیەکان، ئیبتیلاو تاقیکردنەوەیە.

٤- زۆربەی زۆرینەی موسیبەت و بەڵا هەر لەگوناحەوە سەر هەڵدەدا.

٥- شەریعەتی ئیسلام لەگش شەریعەتەکانی تر، لەهەموو ڕوویەکەوە تێرو تەسەل ترە.

### مووسایی و مەسیحیی مەکەنە دۆس:

﴿٥١ یاایهاالذین آمنوا لا تتخذوا الیهود والنصاری اولیاء﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! موسایی و عیسایی مەکەنە دۆست و پشتیوانتان، واتە: نە یارمەتیان بدەن و، نەداوای یارمەتیشیان لێبکەن، وە بەهیچ جۆرێك (موالات) و هاوکاریی و خۆشەویسیتان نەبێ بۆیان ﴿بعضهم اولیاء بعض﴾ چونکە ئەوانە هەندێکیان پشتیوان و یارمەتیدەری هەندێکیانن و، لەبەر ئێوەش دەست لەدینی خۆیان هەڵناگرن و، گشتیشیان بۆ ئێوە دەبنە یەك دەستەو بەستەو، لەرۆژی خۆیدا گەلەکۆمەتان لێدەکەن ﴿ومن یتولهم منکم﴾ و هەرکەسێکیشتان دۆستایەتییان لەگەڵ بکاو، بیانکا بەیارمەتیدەرو دۆستی خۆی، وە یان هاوکاریی و هاوڕێییان بکات ﴿فإنه منهم﴾ بێ شك ئەوکەسە هەر لەوانەو بەوان دادەنرێ، ئەگەرچی بەناسنامەیش موسڵمان بێت ﴿إن الله لا یهدی القوم الظالمین﴾ بێگومان خوا هیدایەت و ڕێنمایی گەلی ناهەق و ستەمکار ناکات، دیارە ئەوانە کە دەبنە دۆست وهاوکاری جوولەکەو فەلەو دووڕازیی، سنووری خوا دەبەزێنن و ستەمکارن، خواش هاوکاریی خەڵکانی ئاوا ناکات.

(ئەبوموسای ئەشعەریی) نووسەرێکی نەسرانیی هەبوو!، کاتێ پێشەوا (عومەر) پێی زانی دەریکردو ڕێی نەدا، ئیش وکاری موسڵمانان بخرێتە بەردەستیی (وەك لەڕێنمایەکانیشدا دێت) ﴿٥٢ فتری الذین فی قلوبهم مرض﴾ دەبینی ئەوانە کە لەدڵیاندا بەرامبەر بەدینی ئیسلام گومان و نەخۆشی هەیە (وەکو ئوبەی و هاوڕێنەکانی ئەو) ﴿یسارعون فیهم﴾ بۆ بەدۆست بوونیان پەلەو تیژڕەوی دەکەن و خۆ دەکێشنە ناویانەوە ﴿یقولون نخشی ان تصیبنا دائرة﴾ ئەمە دەکەنە بیانوو و دەڵێن: دەترسین دووچاری بەڵاو ڕووداوێك ببین، بۆیە دەیانکەینە پشتیوان و ئاشنای خۆمان، شایەد ڕۆژێ موسڵمانەکان لە جەنگەکاندا سەرکەون، ئەوسا ئێمەش هیچ پەنایەکمان نەمێنێ، خاوەننامەکان دەکەینە دۆست، بالەوڕۆژە دژوارەدا پەنامان بدەن و یارمەتیمان بدەن ﴿فعسی الله أن یأتی بالفتح﴾ بێگومان خوا بەم زووانە دەرگای خێرو سەرکەوتن لە پەیامبەرو موسڵمانان دەکاتەوە، ئەوەبوو مەککە ئازاد بوو، جوولەکەی (بەنی قوریزە)شی ریسواکرد ﴿او امر من عنده﴾ یان فەرمانێك لەلایەن خۆیەوە دەربکات بۆ ئابڕووبردنی ناپاکان، وەکو دانانی سەرانەو جیزیە لەسەریان ﴿فیصبحوا علی ما أسروا فی أنفسهم نادمین﴾ ئەوسا ئەوتاقمە دووڕوو ئیمان لاوازانە ، لەسەرئەوکارە دزێوو نیازە گڵاوەیان لەدڵا شاردبوویانەوە پەشیمان ببنەوە، واتە: هیچ کارێکیان پێنەکرێ بۆیان و پەنجەی پەشیمانی بگەزن ﴿٥٣ ویقول الذین آمنوا﴾ ئەوسا کە پیرۆزی هات، ئەوانەش بڕوایان هێناوە بە سەرسوڕمانێکەوە بە گاورو جوولەکەکان دەڵێن: ﴿اهؤلاء الذین اقسموا بالله جهد ایمانهم﴾ ئاخۆ ئەمانە بوون -دووڕووەکان- کە زۆر بەتوندی

الجزء السادس — سورة المائدة

حزب ١٢

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا الْيَهُودَ وَالنَّصَارَىٰ أَوْلِيَاءَ ۘ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ﴿٥١﴾ فَتَرَى الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ يُسَارِعُونَ فِيهِمْ يَقُولُونَ نَخْشَىٰ أَن تُصِيبَنَا دَائِرَةٌ ۚ فَعَسَى اللَّهُ أَن يَأْتِيَ بِالْفَتْحِ أَوْ أَمْرٍ مِّنْ عِندِهِ فَيُصْبِحُوا عَلَىٰ مَا أَسَرُّوا فِي أَنفُسِهِمْ نَادِمِينَ ﴿٥٢﴾ وَيَقُولُ الَّذِينَ آمَنُوا أَهَٰؤُلَاءِ الَّذِينَ أَقْسَمُوا بِاللَّهِ جَهْدَ أَيْمَانِهِمْ ۙ إِنَّهُمْ لَمَعَكُمْ ۚ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فَأَصْبَحُوا خَاسِرِينَ ﴿٥٣﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِ فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ أَذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى الْكَافِرِينَ يُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَائِمٍ ۚ ذَٰلِكَ فَضْلُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَاءُ ۚ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٥٤﴾ إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَالَّذِينَ آمَنُوا الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَهُمْ رَاكِعُونَ ﴿٥٥﴾ وَمَن يَتَوَلَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالَّذِينَ آمَنُوا فَإِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْغَالِبُونَ ﴿٥٦﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا الَّذِينَ اتَّخَذُوا دِينَكُمْ هُزُوًا وَلَعِبًا مِّنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِن قَبْلِكُمْ وَالْكُفَّارَ أَوْلِيَاءَ ۚ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٥٧﴾

١١٧

سوێندیان بەخوا دەخوارد ﴿إنهم لمعكم﴾ كە هەتا سەر لەگەڵتانن و پشتیوانتانن، كەچی ئەوا خوا سڕی هەڵمالین و دەریخست درۆیان لەگەڵ كردن ﴿حبطت اعمالهم﴾ ئەوكارانەی ئەوان كردیان بەفیڕۆ چوون ﴿فاصبحوا خاسرين﴾ دواییەكەش زیانكارو زەرەرمەند بوون و، هیچ پاداشێكیان بۆ نەبوو.

رێنماییەكانی ئایەتی (٥١-٥٣):

١- دۆستایەتی لەگەڵ جوولەكەو نەساراو كافرانی تردا حەرامە، بەڵام لەبواری بازرگانیی و ئاوەدانیی و پیشەسازیی- ئەگەر پێویست بوو- قەیدی نییە.

٢- هاوكاری بێ باوەڕان و مورتەددان بەزیانی موسڵمانان ، بە وەرگەڕان لەدین دادەنرێ.

٣- دۆستایەتی بێ باوەڕان، هەمیشە لەئیمان كزییەوە سەری هەڵداوە، بۆیە ئەنجامەكەیشی هەر كافربوونە.

ئەبوو مووسای ئەشعەری نووسەرێكی گاوری هەبوو، پێشەوا عومەر پێی گوت: دەری بكە باڕوات، پاشان ئەم ئایەتە: (یاأیها الذین آمنوا لاتتخذوا..)ی بۆ دووپاتی مەبەستەكەی خوێندەوەو، تێیگەیاندن كە: نابێ ئەوانە لەئیش وكاری موسڵمانانەوە نزیك بخرێنەوەو، بكرێنە دۆست و ئاشناو پشتیوان.

**پاشگەزبوونەوە لەئیسلام و ئەنجامەكەی:**

﴿[٥٤] یاأیهاالذین آمنوا﴾ ئەی ئەوكەسانەی باوەڕتان هێناوە! ﴿من یرتد منكم عن دینه﴾ هەركەسێكتان لەئایینی خۆی، واتە: لەدینی ئیسلام پاشگەز بێتەوەو وەرگەڕێ ﴿فسوف یأتی الله بقوم﴾ جا خوا لەمەولا كەسانێك دێنێت، ئەوەندە بەرفەرمانی دەبن ﴿یحبهم و یحبونه﴾ خۆشی دەوێن و، ئەوانیش ئەویان خۆشدەوێ ﴿اذلة علی المؤمنین﴾ و لەئاستی خاوەن باوەڕاندا، خۆ بەكەمزان و بەسۆزن ﴿اعزة علی الكافرین﴾ و بەرامبەر بە كافرو بێ باوەڕان، خۆ بەگەورەزان و سەربڵندو دەروون بەرزن و، توندوتیژو بەهەڵمەتن ﴿یجاهدون فی سبیل الله﴾ بۆ ڕەزامەندی خواش تێدەكۆشن و جەنگ دەكەن ﴿ولا یخافون لومة لائم﴾ و لە تەشەرو لۆمەی لۆمەكەرانیش ناترسن و باكیان نابێ، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: ((مایَنْبَغِی للمؤمن انْ یُذِلّ نَفْسَهُ)) بۆ موسڵمان ناشێ خۆی زەلیل و ریسوا بكات، گوتیان: چۆن موسڵمان خۆی ریسوا دەكات؟ فەرمووی: ((یَتَحَمّلُ مِنَ الْبَلاءِ مَالایُطِیقُ)) ئەوەندە بچێتە ژێر بەلاو نارەحەتیی، دەرەنجام بۆی هەڵنەگیرێ و ورە لەدەس بدات ﴿ذلك فضل الله یؤتیه من یشاء﴾ ئەو خۆشەویستی و تێكۆشانە، فەزڵ و بەخششی خوایە، بەهەركەسێك خۆی بییەوێ دەیدا ﴿والله واسع علیم﴾ و خواش فەزڵ و میهرەبانی فراوانە، زۆریش زانایە، دەزانێ كێ شایستەی ئەو بەخشینەیە.

**دەبێ تەنیا خواو پێغەمبەرەكەی و باوەڕداران بكەنە دۆست:**

﴿[٥٥] إنما ولیكم الله ورسوله والذین آمنوا﴾ پشتیوان و دۆستی ئێوە ئەی موسڵمانان! هەرخواو پەیامبەرەكەیی و باوەڕدارانن، نەك جوولەكەو گاورو ئەلقە لە گوێكانیان ﴿الذین یقیمون الصلاة ویؤتون الزكاة وهم راكعون﴾ ئەوانیش ئەوانەن بەرێكوپێكی نوێژ دەكەن و زكات دەدەن و، هەمیشەش دیاردەی كڕنوش و ملكەچی بۆ فەرمانەكانی خوایان پێوە دیارە ﴿[٥٦] ومن یتول الله و رسوله والذین آمنوا﴾ و هەركەسێكیش دۆستایەتی لەگەڵ خواو پەیامبەری خواو ئەوانەدا بكا كە بڕوایان هێناوە، ئەوا دەبنە حیزب و گرووپی خوا ﴿فإن حزب الله هم الغالبون﴾ بێگومانیش تەنیاو تەنیا حیزب و كۆمەڵی خوا سەرفرازو زاڵ و سەركەوتوون.

## ڕێنماییەکانی ئایەتی (٥٤-٥٦):

١- ڕاگەیاندنی هەواڵە غەیبیی و نادیارەکان لەلایەن قورئانەوە، پاشانیش بەڕاست دەرچونیان، بەڵگەی ئەوەن کە قورئان فەرمووده‌و (کەلام)ی خوایە.

٢- فەزیلەت وپلەو پایەی ئیمامی (ئەبی بەکر) و هاوەڵانی بەتایبەتی هۆزی (ئەبی موسای ئەشعەری / یەمەنیی). (ئیبن ئیسحاق) دەڵێ: بێجگە لەعەرەبی مەدینەو، مەککەو، (بەحرەین) هەموو ئەوخەڵکە لەدین وەرگەڕانەوەو، بوونە دووبەش: هەندێکیان هەر زەکاتیان نەدەدا، هەندێکی دیکەیان بە تەواوی دینیان خستە ئەولاوە، جا بۆ ڕاستکردنەوەیان ئیمامی (ئەبو بەکر)و هاوەڵانی، جەنگیان لەگەڵ کردن.


الجزء السادس — سورة المائدة

وإذا ناديتم إلى الصلوة اتخذوها هزوا ولعبا ذلك بأنهم قوم
لا يعقلون ﴿٥٨﴾ قل يأهل الكتب هل تنقمون منا إلا أن ءامنا
بالله وما أنزل إلينا وما أنزل من قبل وأن أكثركم فسقون ﴿٥٩﴾ قل
هل أنبئكم بشر من ذلك مثوبة عند الله من لعنه الله وغضب
عليه وجعل منهم القردة والخنازير وعبد الطغوت أولئك شر
مكانا وأضل عن سواء السبيل ﴿٦٠﴾ وإذا جاءوكم قالوا ءامنا
وقد دخلوا بالكفر وهم قد خرجوا به والله أعلم بما كانوا يكتمون
﴿٦١﴾ وترى كثيرا منهم يسرعون في الإثم والعدون وأكلهم
السحت لبئس ما كانوا يعملون ﴿٦٢﴾ لولا ينههم الربنيون
والأحبار عن قولهم الإثم وأكلهم السحت لبئس ما كانوا
يصنعون ﴿٦٣﴾ وقالت اليهود يد الله مغلولة غلت أيديهم ولعنوا
بما قالوا بل يداه مبسوطتان ينفق كيف يشاء وليزيدن كثيرا
منهم ما أنزل إليك من ربك طغينا وكفرا وألقينا بينهم العدوة
والبغضاء إلى يوم القيمة كلما أوقدوا نارا للحرب أطفأها الله
ويسعون في الأرض فسادا والله لا يحب المفسدين ﴿٦٤﴾

١١٨ — ولو أن

٣- خۆشەویستی خواو ڕێز بۆ بڕواداران و، پەستکردنی بێ بڕواو کافران و گەورەیی جیهادو سەقامگیر بوون لەسەریی و گوێ نەدان بەلۆمەی لۆمەکەران.

٤- فەزیلەتی نوێژکردن و زەکات دان و ڕکوع بردن بۆخوا.

٥- سەرپەرستی و چاودێری خوا بۆ بڕواداران، مانای زاڵکردن و سەرخستنیانە.

### ئەوانەگاڵتە بە دینتان دەکەن، مەیانکەنە دۆس:

﴿٥٧ یاأیها الذین آمنوا﴾ ئەی گەلی خاوەن باوەڕ! ﴿لا تتخذوا الذین اتخذوا دینکم هزوا و لعبا﴾ لەگەڵ ئەوکەسانەدا لاقرتی و گاڵتە بەدینتان دەکەن دۆستایەتی مەکەن ﴿من الذین أوتوا الکتاب من قبلکم والکفار اولیاء﴾ چ ئەوکەسانە بن پێش ئێوە کتێب و نامەیان بۆ هاتووە، چ ئەوانەبن موشریك و بێ باوەڕن، واتە: ئەوکەسانە ڕێز لە دین‌و ئاییتنتان نانێن و سووکایەتی پێدەکەن، ئێوەش ڕێزیان لێ مەنێن و دۆستایەتیان لەگەڵ مەکەن و، مەیانکەنە هاوکارو هاوڕێی خۆتان ﴿واتقوا‌الله إن کنتم مؤمنین﴾ و دەبێ پارێز لەخوا بکەن و، هەرگیز لاریی و نافەرمانی نەکەن، ئەگەر ئێوە بەڕاستیی بڕوادارن.

### بێ دین گاڵتە بە بانگ و نوێژ دەکات:

﴿٥٨ وإذا نادیتم إلی الصلاة اتخذوها هزوا ولعبا﴾ هەرکە بۆ نوێژکردن بانگ دەڵێن، ئەمانە لاقرتی و گەمەو گاڵتەی پێدەکەن ﴿ذلك بأنهم قوم لا یعقلون﴾ ئەوەش چونکە گەلێکی نەفام و بێ عەقڵ و بێ ئاوەزن و، بیر لە پاشەڕۆژی خۆیان ناکەنەوە، دیارە کارو ڕەوشی وا، داب ونەریتی گش شوێنکەوتووەکانی شەیتانە، وەکو پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ((إذا سَمِعَ الأذانَ أدبَرَ ولَهُ حُصَاصٌ -أيْ ضُرَاطٌ- حتی لایَسْمَعَ التأذینُ، فإذا قُضِیَ التاذین أقْبَلَ، فإذا ثُوِّبَ للصلاة أدْبَرَ، فإذاقُضِیَ التَّثْوِیبُ أقْبَلَ، حتی یَخْطُرَ بَیْنَ المَرْءِ وقَلْبِه فیقول: اذْکُرْ کذا، اذْکُرْ کذا، لِمالَمْ یَکُنْ یَذْکُرُ حتی یَظَلَّ الرجلُ لایَدْرِی کَمْ صَلَّی ، فإذا وَجَدَ احدُکُمْ ذلِكَ، فَلْیَسْجُدْ سَجْدَتَیْنِ قَبلَ السلام)). (متفق

علیه). ئەوانە زۆر دڵگران دەبن بەنوێژوو خواپەرستیی موسڵمانان و، زۆریش پێیان ناخۆش دەبێت، ئەربۆشیان بکرێ، درێغی ناکەن لەداخستنی مزگەوتەکان!.

**خاوەن کتێبەکان رکیان لە ئیماندارەکانە :**

﴿٥٩ قل يا اهل الكتاب﴾ بەوخاوەن نامانە -گاڵتە بەنوێژ دەکەن- بڵێ: ﴿هل تنقمون منا إلا ان امنا بالله وما انزل إلينا وما انزل من قبل﴾ کە مەسخەرە دەکەن و تانەو توانج دەگرن، مەگەر هەر لەبەرئەمە نییە کە ئێمە باوەڕمان هەیە بەخواو، بەوقورئانە نێردراوەتە لامان و، بەوکتێبانەش پێش ئەم قورئانە نێردراون ﴿وان اكثركم فاسقون﴾ و دەشزانین کە بێگومان بەشی زۆرتان لە سنوور دەرچوون و لاتان داوە، بۆیە ئاوا رێ بە بەختی خۆتان نابەن؟ ﴿٦٠ قل هل انبئكم بشر من ذلك مثوبة عندالله﴾ پێیان بڵێ: ئاخۆ دەتانەوێ لای خوا ئاگادارتان بکەم لە سزاو تۆڵەی خراپتر لەوە؟ واتە: ئێوە ئێمە بەخراپ دەزانن! بەلاّم چاك بزانن کە خەڵکانێ خراپن ﴿من لعنه الله وغضب عليه﴾ خوا نەفرینی لێکردون و خەشم و قینی لێهەڵگرتوون ﴿وجعل منهم القردة و الخنازير﴾ و هەندێکیشیانی کردە مەیمون و بەراز ﴿وعبد الطاغوت﴾ وبت و تاغووت و شەیتانیان پەرست ﴿اولئك شر مكانا﴾ جێگای ئەمانە لەگشت جێیەك خراپترە ﴿واضل عن سواء السبيل﴾ و لە راستە رێ زۆر لارێ و لادەرن، ئەمانە گومڕاو بەدکارو بەدفەڕن، نەك ئیماندارەکان، خوای گەورە لەوەسفی ئیمانداراندا دەفەرموێ: (أصحاب الجنة يومئذ خير مستقرا وأحسن مقيلا).

**رێنماییەکانی ئایەتی (٥٧-٦٠):**

١- نابێ یەهوودو نەسارا، بکرێنە دۆست و یارو یارمەتی بدرێن، وەیان یارمەتیان لێوەربگیردرێ، بە تایبەتی دڵرەق و ستەمکارەکانیان، (جوبیر) ئەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کەویستی بچێت بۆ ئوحود، تاقمێ لەجوولەکە هاتن خۆیانیان ئامادەکرد لەگەڵیا بچن، ئەوسا پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((إنّا لانَسْتَعِينُ على أَمْرِنَا بالمُشْرِكِينَ)).

٢- بەدرەوشتی یەهوودو بێ ئەقڵییان.

٣- یەهوود زۆر هەوڵدەدا بۆگومڕا کردنی موسڵمانان.

٤- یەهوود بوونە (مەیموون)، وەکو لە سوورەتی (بەقەرە)، ئایەتی (٦٥) دا هاتووە. شاعیرێکیش دەڵێ:

فلعنة الله على اليهود *** إن اليهود إخوة القرود

٥- جوولەکە لە قیامەتدا لە هەمووکەس جێ و رێیان خراپترە.

﴿٦١ وإذا جاؤكم قالوا آمنا﴾ هەرکە دێنە لاتان -ئەو جوولەکەو دووڕووانە- بەدرۆ دەڵێن: ئێمەیش موسڵمانین و بڕوامان بە ئایین و بە پەیامبەر هێناوە ﴿وقد دخلوا بالكفر وهم قد خرجوا به﴾ کەچی هەر بە بێ باوەڕی هاتنە ژوور لای تۆو، هەر بەبێ باوەڕیش چوونە دەرێ، واتە: هاتنەکەیان هیچ کەڵکێکی نەبوو بۆیان و، هەر بەکوفرەوە هاتن و، هەر بەکوفریشەوە دەرچوون ﴿والله أعلم بما كانوا يكتمون﴾ و خوا بەوەی لەدڵ و دەرونیاندا شاردیانەوە، لەگش کەسێ زاناترە ﴿٦٢ وترى كثيرا منهم يسارعون فى الإثم والعدوان﴾ زۆرێ لەو جوولەکانە دەبینی، پەلەو چەسپانی دەکەن بۆ ئەنجامدانی تاوان و دەست درێژیی ﴿واكلهم السحت﴾ و خواردنی ماڵی حەرام، چونکە کاری وابۆتە پیشەیان ﴿لبئس ماكانوا يعملون﴾ دیارە کە کارێکی زۆرخراپیانکرد.

**دەبێ خواناس و زانا ڕێ لە حەرا مخۆری بگرن:**

﴿[٦٣] لولا ینهاهم الربانیون والأحبار عن قولهم الإثم واكلهم السحت﴾ بۆ چ پێشەواو زانایانی خوایی و زانا بلیمەتەکانیان، یەهوود لەوتەی تاوان و خواردنی ماڵی حەرام ناگێڕنەوە؟ واتە: هەقە زاناو داناو پیاوە چاکەکانیان نەهێڵن ئەوانە سەر بکەنە ئەو جۆرە تاوانانە ﴿لبئس ماکانوا یصنعون﴾ بەڕاستیی ئەو بێدەنگیی و گوێ نەدانەی زاناو پێشەواکان کارێکی زۆر نادروست و خراپە.

**ڕێنماییەکانی ئایەتی (٦١-٦٣):**

١- لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ دەستەیە دوو ڕووی یەهوود لەمەدینە هەبوون.

٢- جوولەکە زۆر بایەخ بەگوناح و تاوان دەدەن، خراپیی و نەشیاوی بێ دەنگی زاناکان لەبەرامبەر گشت کارێکی (مونکەر) و فەسادەوە، تەنانەتی هەندێ لە (سەلەف) دەڵێن: (إن هذه الآیة أشد آیة وأخطرها علی العلماء) واتە: بەڕاستیی ئەم ئایەتە، لەگشت ئایەتەکانی قورئان - خەتەرترو سامناکترە بۆ - زاناکان.

**جوولەکە دەڵێن خوا دەستی بەستراوە!:**

﴿[٦٤] وقالت الیهود یدالله مغلولة﴾ (فەنحاس)ی یەهودیی نەفام ونەزان گوتی: خوا دەستی زنجیرکراوەو بەستراوە، بۆیە وا ڕژدو چروکەو، ڕزق و ڕۆزیی بە بەندەکانی خۆی نادا! ﴿غلت ایدیهم﴾ دەك دەستی ئەوان کەلەبچەو ئیفلیج بێ و، شەلەل لێی بداو، هەرئەوانیشن ڕژدو چرووك ﴿ولعنوا بما قالوا﴾ وە لەبەرئەو قسەشیان نەفرینی خوایان لێکرا، بۆیە بەردەوام چکووس و بەخیلن ﴿بل یداه مبسوطتان﴾ نەخێر دەستی خوا نەبەسراوە، وەکو ئەوان دەڵێن، بەڵکو هەردوو دەستی خوا هەمیشەو بەردەوام والآو گوشادن ﴿ینفق کیف یشاء﴾ هەرچۆنێك خۆی بییەوێ، دەیبەخشێ. پێشەوا (ئەحمەد - خوای لێ ڕازیی بێ) ئەم فەرموودەیەی هێناوە: ((إنَّ یَمینَ اللهِ مَلأیَ، لایَغیضُها نَفَقَةٌ سَحَّاءُ اللیلَ والنهارَ، أرَأیْتُم ما أنْفَقَ منذُ خَلَقَ السموات والأرْضَ، فإنَهُ لَمْ یَغِضْ ما فی یَمینِهِ. قال: وَ عَرْشُهُ علی الماءِ، وفی یده الأخری الفَیْضُ - او القَبْضُ- یَرْفَعُ ویَخْفِضُ)). وقال: (یقول الله تعالی: أَنْفِقْ أُنْفِقْ عَلَیْكَ / متفق علیه. ﴿و لیزیدن کثیرا منهم ما انزل إلیك من ربك طغیانا و کفرا﴾ بێ شك ئەو قورئانەی لەلایەن پەروەردگارتەوە بۆت نێردرا لەباتی ئەوە بڕوای پێ بهێنن، کەچی زۆرێکیان زیاتر ڕۆدەچن لەسەرکەشیی و بێ باوەڕیدا! بەڵێ قورئان بۆ مرۆی ئیماندار دەبێتە مایەی ڕێنمایی و ڕەحمەت، کەچی بۆ مرۆڤی تاوانبارو دڵرەق، یاخیی تر دەبن! وەکو دەفەرموێ: (قل هو للذین آمنوا هدی وشفاء والذین لایؤمنون فی آذانهم وقر وهو علیهم عمی..) ﴿و القینا بینهم العداوة والبغضاء إلی یوم القیامة﴾ ئێمەش تاڕۆژی قیامەت، دوژمنایەتی و کینەو ڕقەبەریمان لەنێوان (جوولەکەو گاور)اندا بەرپاکرد، واتە: هەرگیز دڵیان هۆگری یەکنابێ و، هەمیشە خەریکی دووبەرەکی و دوژمنایەتین ﴿کلما اوقدوا نارا للحرب اطفأهاالله﴾ هەرچەن ئاگری شەڕیشیان هەڵگیرساندبێ، خوا بۆخۆی کوژاندوویەتیەوەو نەیانتوانیوە زیانت لێبدەن ﴿ویسعون فی الأرض فسادا﴾ هەمیشەش لەوڵاتدا، لەهەوڵدان بۆ بڵاوکردنەوەی فەسادو خراپەو گێرەشێوێنی ﴿والله لایحب المفسدین﴾ بێگومان خواش خەڵکی خراپەکار و گێرەشێوێنی خۆشناوێ ﴿[٦٥] ولو ان اهل الکتاب آمنوا واتقوا﴾ خۆئەگەر خاوەن کتێب و نامەکان بڕوایان هێناباو، لەنافەرمانی خوا خۆیان پاراستبا ﴿لکفرنا عنهم سیئاتهم﴾ هەرگوناهێ کردبوویان، دەمانپۆشی ﴿و لأدخلناهم جنات النعیم﴾ و دەمان بردنە ناو چەندین باخ و باخاتێ پڕبوو لە خۆشیی و نیعمەت.

**کارکردن بە بەرنامەی خوا، مایەی خۆشگوزەرانییە:**

﴿[٦٦] ولو انهم اقاموا التوراة والإنجيل﴾ و ئەگەر مووسایی و عیسایییەکان، هەستان بە کارکردن بەتەورات و ئینجیل ﴿وما انزل إليهم من ربهم﴾ و ئەو قورئانەی لەلایەن پەروەردگاریانەوە نێردراوە بۆیان ﴿لأكلوا من فوقهم ومن تحت ارجلهم﴾ ئەو دەمە لای سەروویانەوەو لەبەر پێیانەوە، نازونیعمەتی خوایان دەخوارد، واتە: خوا بەرەکەت و پیتی ئاسمان و زەوی بۆ دەباراندن، لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: (ولو أن أهل القرى آمنوا واتقوا لفتحنا عليهم بركات من السماء والأرض..) ﴿منهم امة مقتصدة﴾ هەیانە ژیرو میانەڕەون ﴿وكثير منهم ساءما يعملون﴾ زۆریکیشیان خراپ و بەدفەڕانە کاردەکەن، لەجێیەکی تردا هاتووە: (ومن قوم موسى أمة يهدون بالحق وبه يعدلون).

**هەرچی لە خواوە هاتووە، دەبێ ڕابگەیەنرێ:**

﴿[٦٧] يا ايها الرسول بلغ ما انزل إليك من ربك﴾ ئەی پەیامبەر! ﷺ هەر فەرمان وبریارێك لەلایەن پەروەردگارتەوە بۆت هاتووە، بێ دوودڵی و ترس لەهیچ کەسێ ڕایگەیەنە ﴿وإن لم تفعل فما بلغت رسالته﴾ خۆئەگەر وات نەکرد، چاك بزانە کە بەتەواوی پەیامەکەی خوات نەگەیاندووە، خاتوونە عائیشە دەڵێت: ئەر پێغەمبەر بیتوانایە ئایەتێك لەقورئان بشارێتەوە، ئەوا ئایەتی: (و تخفى فى نفسك ماالله مبديه وتخشى الناس والله أحق أن تخشاه..) دەشاردەوە. بوخاری وموسلیم. ﴿والله يعصمك من الناس﴾ دڵنیاشبە خوا لەئازارو پیلانی ئەو خەڵکە دەتپارێزێ، هەر کە بیانەوێ دووچاری بەڵایەکت بکەن، لەوبارەوە خاتوو عائیشە —خوا لێی ڕازی بێت— دەڵێت: پەیامبەر ﷺ هەمیشە پاسەوانی هەبوو، هەتا ئایەتی (والله يعصمك من الناس)ی بۆهات، ئەوسا فەرمووی: خەڵکینە! ئیتر ئێوە بچن بەلای کارتانەوە، چونکە من خوا دەمپارێزێ. متفق علیه. ﴿إن الله لا يهدى القوم الكافرين﴾ بێگومان خوای گەورە هیدایەت و ڕێنوێنی هۆزو گەلی بێ باوەڕان ناکات، بەڵێ پێغەمبەر ﷺ بێ کەم و زیاد پڕبەپڕ شەریعەت و بەرنامەکەی خوای گەیاندو هاوەڵانیشی کردەشایەد، لە (حجة الوداع)دا نزیکەی (١٤٤) هەزار کەس لەهاوەڵان گوێ بیستی بوون کە فەرمووی: خەڵکینە! ئێوە کە پرسیاری منتان لێدەکرێت، چ دەڵێن؟ گوتیان: (نَشْهَدُ انكَ قَدْ بَلَّغْتَ وأدَّيْتَ ونَصَحْتَ). ئەوجا ئەویش پەنجەی بۆ ئاسمان بەرزەوەکرد و فەرمووی: ((اللهمّ هَلْ بلغتُ؟ اللهم هل بلغت)) موسلیم. ﴿[٦٨] قل يا اهل الكتاب لستم على شئ﴾ بڵێ: ئەی خاوەننامەکان! ئێوە لەسەر هیچ بەرنامەو ئاینێکی دروست و ڕەوان نین ﴿حتى تقيموا التوراة و الإنجيل﴾ هەتا بەپێی تەورات و ئینجیل ﴿وما انزل إليكم من ربكم﴾ و ئەوی لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆتان هاتووە نەجوڵێنەوە، واتە: دەبێ ئیقامەی تەواوی کتێبەکانی خوا بکەن ﴿و ليزيدن كثيرا منهم ما انزل إليك من ربك طغيانا وكفرا﴾ بێگومان لەباتی گوێڕایەڵی لەو قورئانەی لەلایەن پەروەردگارتەوە بۆت

الجزء السادس — سورة المائدة

وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّقَوْا۟ لَكَفَّرْنَا عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ وَلَأَدْخَلْنَٰهُمْ جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٦٥﴾ وَلَوْ أَنَّهُمْ أَقَامُوا۟ ٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِم مِّن رَّبِّهِمْ لَأَكَلُوا۟ مِن فَوْقِهِمْ وَمِن تَحْتِ أَرْجُلِهِم ۚ مِّنْهُمْ أُمَّةٌ مُّقْتَصِدَةٌ ۖ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ سَآءَ مَا يَعْمَلُونَ ﴿٦٦﴾ ۞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغْ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ۖ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُۥ ۚ وَٱللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٦٧﴾ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لَسْتُمْ عَلَىٰ شَىْءٍ حَتَّىٰ تُقِيمُوا۟ ٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ ۗ وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم مَّآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ طُغْيَٰنًا وَكُفْرًا ۖ فَلَا تَأْسَ عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٦٨﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَٱلَّذِينَ هَادُوا۟ وَٱلصَّٰبِـُٔونَ وَٱلنَّصَٰرَىٰ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٩﴾ لَقَدْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَأَرْسَلْنَآ إِلَيْهِمْ رُسُلًا ۖ كُلَّمَا جَآءَهُمْ رَسُولٌۢ بِمَا لَا تَهْوَىٰٓ أَنفُسُهُمْ فَرِيقًا كَذَّبُوا۟ وَفَرِيقًا يَقْتُلُونَ ﴿٧٠﴾

ربع الحزب ١٢

١١٩

هات ئەی پێغەمبەر! ﷺ زۆرێکی خاوەننامەکان سەرکەشترو بێ باوەڕتر دەکا ﴿فلا تأس على القوم الكافرين﴾ دەساتۆش بۆ گەل و کۆمەڵی بێ باوەڕان هەرکە بڕواناهێنن، غەمبارو دڵغەمگین مەبە ﴿٦٩ إن الذين آمنوا والذين هادوا﴾ بێگومان ئەوانەی بڕوایان هێناو ئەوانەش جوولەکەن شوێنکەوتووانی مووسا ﴿والصابئون والنصارى﴾ سوبیان و فەلەکانیش، (سایبە): بەچەند جۆرێك تەفسیر کراوەتەوە، بەلام ئەوەیان زۆرتر بچێتە دڵەوە ئەمەیە کەئەوانە کۆمەڵێك بوون لەپێش هاتنی ئیسلامدا، هەر خوایان دەپەرست، بێ ئەوەی مەزهەبێکی دیارییان بۆ خۆیان هەبووبێ ﴿من آمن بالله واليوم الآخر وعمل صالحا﴾ هەرکامێکیان بڕوای دامەزراوی بەخواو بەرۆژی دوایی هەبێ و ئاکاری چاك بێ ﴿فلا خوف عليهم ولا هم يحزنون﴾ نەهیچ ترسێکیان لەدوارۆژدا هەیە، نە دڵ زویریشن بۆدنیایان، بەڵکو بەئارەزووی خۆیان دڵخۆش دەکرێن.

رێنماییەکانی ئایەتی (٦٧-٦٩):

١- دەبێ پێغەمبەران بەتەواویی و بێ ماتڵبوون سپاردەکەیان رابگەیەنن، پیاو هەق بڵێ پێغەمبەریشمان موحەممەد ﷺ وەکو پێغەمبەرانی تر، باش هەستا بەئەنجامدانی ئەرکەکانی سەرشانی.

٢- ئەم ئایەتە دەمکوتی ئەوانە دەکات کە دەڵێن: پەپێغەمبەر ﷺ کیتمانی هەندێ لە وەحیی و سپاردەکەی خوای کردووە! دایکی موسڵمانان خاتوو عائیشە دەڵێ: ئەگەر پێغەمبەر ﷺ توانیبای تەنها شتێکی کەمیش بشاریتەوە، ئەوا ئایەتی (عبس وتولى)ی دەشاردەوە.

٣- عیسمەت و پارێزراوی لە گشت شتێك تەنها بۆ پێغەمبەرە ﷺ. خاوەننامەکان بەکافرو بێ بڕوا دادەنرێن، مەگەر ئەوانەیان بڕوا بە موحەممەدیش بێنن و پەیڕەوی لەپەیامەکەشی بکەن.

٤- خەڵکانی عینادو خۆ بەزلزان هەتابێت بەبەڵگەو نیشانەکانی خوا، سەرکێشتر دەبن.

﴿٧٠ لقد أخذنا ميثاق بني إسرائيل﴾ بێگومان ئێمە پەیمانی بەهێزو پتەومان، لەنەوەی یەعقووب وەرگرت وپێمانگوتن کە: هەمیشە گوێڕایەڵ و بەرفەرمانبن ﴿وأرسلنا إليهم رسلا﴾ و گەلێ پەیامبەریشمان بۆناردن، بۆ تێگەیاندنی ئەو مەبەستە ﴿كلما جاءهم رسول بما لاتهوى انفسهم﴾ کەچی هەرجارەی یەکێ لەو پەیامبەرانە بە پێچەوانەی ئارەزووی ئەوان شتێکی بۆ هێنابان، ئیتر بەهۆی لاساری خۆیانەوە ﴿فريقا كذبوا وفريقا يقتلون﴾ دەستەیەك لەپەیامبەرەکانیان بەدرۆزن دادەناو دەستەیەکیشیان هەر بەکوشتن شەهیدیان دەکردن ﴿٧١ وحسبوا الا تكون فتنة﴾ پێشیان وابوو هەرگیز سزاو بەلایان بۆ نایەو، خوا لەسەر ئەوکارە لێیان ناگرێ ﴿فعموا وصموا﴾ ئینجا دەربارەی حەق و ڕاستیی کوێرو کەڕ بوون ﴿ثم تاب الله عليهم﴾ پاشان پەشیمان بوونەوەو خوا تەوبەی لێوەرگرتن ﴿ثم عموا وصموا كثير منهم﴾ بەلام دیسانەوە بەشێکی زۆریان، لەئاستی ڕاستیی و هەقدا، پاش ئەوە خوا تۆبەی لێوەرگرتن کوێروکەڕ بوونەوە ﴿والله بصير بما يعملون﴾ خواش بە هەموو ئەوشتەی ئەوان دەیکەن بینایە و، تۆڵەشیان لێوەردەگرێ.

### ئەوانەی دەڵێن خوا خۆی مەسیحی کوڕی مەریەمە، لەدین وەرگەڕاون:

﴿٧٢ لقد كفر الذين قالوا إن الله هو المسيح ابن مريم﴾ عیساییەکان-ئەوانەیان دەڵێن: خوا خۆی مەسیحی کوری مەریەمە-بێگومان کافرن، چونکە خوا بۆ خۆی تاك و تەنیایەو، (مەسیح)یش هێمان هەر لەبێشکەدا بوو گوتی: (إني عبدالله آتاني الكتاب و جعلني نبيا) هەتا ئەوە کە گوتی: (وإن الله ربي وربكم فاعبدوه هذا صراط مستقيم) ﴿وقال المسيح يا بني إسرائيل﴾ مەسیحیش کاتێ رەوانە کرا گوتی: ئەی نەوەکانی یەعقوب! ﴿اعبدوالله

﴿ربی و ربكم﴾ دەبیٚ ئیٚوە هەر ئەوخوایە بپەرستن كە پەروەردگاری من و پەروەردگاری ئیٚوەشە ﴿إنه من يشرك بالله﴾ چاك بزانن كە هەركەسیٚك شەریك و هاوبەش بۆخوا دابنیٚ ﴿فقد حرم الله عليه الجنة﴾ بیٚ شك خوا بەهەشتی لەسەر یاساغ دەكا ﴿و مأواه النار﴾ جیٚ و شویٚنی ئاگرە. پیٚغەمبەریش ﷺ لەوبارەیەوە دەفەرمویٚ: ((إن الجَنَّةَ لا يَدْخُلُهَا إلا نَفْسٌ مسلمةٌ – وفی لفظ – مؤمنةٌ)) فتح الباری. واتە بەدەر لەموسلْمان كەسی تر ناچیٚتە بەهەشتەوە. ﴿وما للظالمين من انصار﴾ ستەمكارانیش هیچ جۆرە یارمەتی دەریٚكیان بۆ نییەو رزگار نابن.

رِیٚنماییەكانی ئایەتی (٧٠-٧٢):

١- هەمیشە میٚژووی یەهوود پرە لەكاری بەدفەرو تاوان و قەتلٚ و عام.

٢- خوا گەلیٚ ریٚزی لەجوولەكە ناوە، كەچی لەگەلٚ ئەوەیشدا ئەوان زۆر لاسارو لاریٚ و لاساربوون.

٣- ددان نان بەكوفری ئەو تاقمە نەسارانەدا كەدەلیٚن: (مەسیح) خوایە.

٤- بەهەشت بۆ هیچ كەسیٚ نییە هاوبەش بۆ خوا دابنیٚ.

﴿[٧٣] لقد كفرالذين قالو إن الله ثالث ثلاثة﴾ بیٚگومان ئەو گاورانەی گوتیان: خوا سیٚهەمینە لەسیٚ دانە خواكە، كافرو بیٚ باوەرن، گاورەكان دەستەیەكیان دەلیٚن: (خوایەتی) دابەشكراوە لەنیٚوان خواو عیساو مەریەمدا! بۆیە خواش فەرمووی ئەوانە كافرن ئەم قسانە دەكەن، لەكۆتایی سوورەتەكەدا دیٚت: (وإذ قال الله يا عيسى ابن مريم أأنت قلت للناس اتخذونی وأمی إلهين من دون الله قال سبحانك..) ﴿وما من إله إلا إله واحد﴾ خۆ جگە لەخوای تاكو تەنیا، هیچ پەرستراویٚك بۆ پەرستن ناشیٚ و نییە ﴿وإن لم ينتهوا عما يقولون﴾ خۆئەگەر كۆتایی بەو قسانەیان نەهیٚنن ﴿ليمسن الذين كفروا منهم عذاب اليم﴾ ئەوا لەرۆژی سەلاٚدا سزایەكی ئیٚش پیٚگەیەنەر، تووشی ئەوانەیان دەبیٚ لەدین لایانداوە ﴿[٧٤] افلا يتوبون إلى الله ويستغفرونه﴾ جا ئایا حەق نییە ئەوانە لەوتاوانە گەورەیە پەشیمان ببنەوەو داوای لیٚبوردن لەخوا بكەن؟ ﴿والله غفور رحيم﴾ خواش زۆر لیٚبووردەیە، زۆریش میهرەبانە، لەگەلٚ ئەوهەلاٚنەشدا -پاش تەوبە- دەیان بەخشیٚت ﴿[٧٥] ماالمسيح ابن مريم إلا رسول﴾ مەسیحی كوری مەریەمیش تەنیاو تەنیا پیٚغەمبەریٚك بووەو هیچی تر ﴿قدخلت من قبله الرسل﴾ بەرلەویش بیٚسۆ چەند پەیامبەریٚ بوون و تیٚپەرین ﴿وامه صديقة﴾ ودایكیشی ژنیٚكی زۆر راست بوو ﴿كانا يأكلان الطعام﴾ هەردوو وەكو خەلٚكی تر خواردنیان دەخواردو پیٚویستیان بەخۆراك هەبوو، جائەر خوا بوونایە، چۆن پیٚویستیان بەخۆراك دەبوو؟ ﴿انظر كيف نبين لهم الآيات﴾ دەسا سەیر بكە و بزانە چۆن ئیٚمە ئەوهەموو نیشانەو بەلٚگانەیان بۆشیی دەكەینەوە؟ ﴿ثم انظر انى يؤفكون﴾ دیسانەوە بروانەو چاكبزانە دوای ئەوهەموو روونكردنەوەیە چۆن

الجزء السادس — سورة المائدة

وَحَسِبُوٓاْ أَلَّا تَكُونَ فِتْنَةٌ فَعَمُواْ وَصَمُّواْ ثُمَّ تَابَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ ثُمَّ عَمُواْ وَصَمُّواْ كَثِيرٌ مِّنْهُمْ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴿٧١﴾ لَقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ وَقَالَ ٱلْمَسِيحُ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبَّكُمْ إِنَّهُۥ مَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ ٱلْجَنَّةَ وَمَأْوَىٰهُ ٱلنَّارُ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴿٧٢﴾ لَّقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٍ وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّآ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ وَإِن لَّمْ يَنتَهُواْ عَمَّا يَقُولُونَ لَيَمَسَّنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٣﴾ أَفَلَا يَتُوبُونَ إِلَى ٱللَّهِ وَيَسْتَغْفِرُونَهُۥ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٧٤﴾ مَّا ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ وَأُمُّهُۥ صِدِّيقَةٌ كَانَا يَأْكُلَانِ ٱلطَّعَامَ ٱنظُرْ كَيْفَ نُبَيِّنُ لَهُمُ ٱلْءَايَٰتِ ثُمَّ ٱنظُرْ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٧٥﴾ قُلْ أَتَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَمْلِكُ لَكُمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا وَٱللَّهُ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٧٦﴾

قُلْ يَٰٓأَهْلَ ١٢٠

لەئاستیی هەقدا ترازێنران و نەچوون بەلای راستیدا و بەردەوام درۆ هەڵدەبەستن؟ ﴿قل اتعبدون من دون الله ما لا یملك لكم ضرا ولا نفعا﴾ پێیان بڵێ: ئاخۆ کەی راستە ئێوە بێجگە لەخوا کەسێکی وەك عیسا دەپەرستن کە: دەسەڵاتی نییە هیچ زیان و سوودێکتان پێبگەیەنێت ؟ ﴿والله هوالسیمع العلیم﴾ خۆ هەرتەنها خوا خۆی بیسندەی راستەقینەیە ، بەئاگاو زانایە بە هەڵسوکەوتتان، واتە: دەبۆچی لە پەرستنی ئەو کلابوون و لاڕێ بوون.

رێنماییەکانی ئایەتی (٧٣-٧٦):

١- بەتاڵ کردنەوەی بیرو بڕوای نەسارا لەبارەی بڕیاردانی بوونی سێ خوا.

٢- بێزاریی و نکووڵی عیساو دایکی عیسا لەوکەسانە بەخوایان دادەنێن.

٣- کردنەوەی دەروازەی تەوبە لە نەسارا.

٤- عیساو دایکی هەردوو ئینسانن نەك خوا، بەپێی ئەوەکە هەردووکیان دەخۆن و دەخۆنەوە، دیارە ئەمەش پەسنی مرۆڤە، نەك خوای بەدیهێنەر.

الجزء السادس — سورة المائدة

قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لَا تَغْلُوا۟ فِى دِينِكُمْ غَيْرَ ٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعُوٓا۟ أَهْوَآءَ قَوْمٍ قَدْ ضَلُّوا۟ مِن قَبْلُ وَأَضَلُّوا۟ كَثِيرًا وَضَلُّوا۟ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ ﴿٧٧﴾ لُعِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ لِسَانِ دَاوُۥدَ وَعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ ۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا۟ وَّكَانُوا۟ يَعْتَدُونَ ﴿٧٨﴾ كَانُوا۟ لَا يَتَنَاهَوْنَ عَن مُّنكَرٍ فَعَلُوهُ ۚ لَبِئْسَ مَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴿٧٩﴾ تَرَىٰ كَثِيرًا مِّنْهُمْ يَتَوَلَّوْنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ لَبِئْسَ مَا قَدَّمَتْ لَهُمْ أَنفُسُهُمْ أَن سَخِطَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ وَفِى ٱلْعَذَابِ هُمْ خَٰلِدُونَ ﴿٨٠﴾ وَلَوْ كَانُوا۟ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلنَّبِىِّ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مَا ٱتَّخَذُوهُمْ أَوْلِيَآءَ وَلَٰكِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ ﴿٨١﴾ ۞ لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ ٱلنَّاسِ عَدَٰوَةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱلْيَهُودَ وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ ۖ وَلَتَجِدَنَّ أَقْرَبَهُم مَّوَدَّةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّا نَصَٰرَىٰ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّ مِنْهُمْ قِسِّيسِينَ وَرُهْبَانًا وَأَنَّهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ﴿٨٢﴾

١٢١

**شیرك دانان بۆ خواو ، زیادەڕۆیی لەدیندا :**

﴿٧٧ قل یاأهل الکتاب لا تغلوا فی دینکم غیر الحق﴾ ئەی پێغەمبەر ﷺ! بەخاوەن نامەکانی (نەسارا) بڵێ: کاری ناڕەواو زیادەڕۆیی لەئایینی خۆتاندا بەناهەق مەکەن، مەڵێن: عیسا خوایە، یان کوڕی خوایە ﴿ولا تتبعوا أهواء قوم قد ضلوا من قبل﴾ و مەکەونە شوێنی هەواو ئارەزووی ئەو جوولەکانەش کەهەر بەرلە هاتنی ئەم پەیامبەرە، گومرابوون و دەیانگوت: عیسا زایینەی زینایە! ﴿واضلوا کثیرا﴾ و خەڵکێکی زۆریشیان لەڕێ گومرا کردو لەخشتە برد ﴿وضلوا عن سواء السبیل﴾ وخۆشیان لەڕاستە ڕێگە گومڕاو کلابوون و دوورکەوتنەوە.

**نەعلەتی خوا لە کافرانی بەرەی ئیسرائیل :**

﴿٧٨ لعن الذین کفروا من بنی إسرائیل علی لسان داود وعیسی ابن مریم﴾ لەسەر زمانی (داود)و (عیسای کوڕی مریەم)، نەفرین و نەعلەت، لەو (بەنی ئیسرائیل)ـە کافرو بێ باوەڕانە کرا. (قورتووبی) ئەڵێ: جا کەوابوو نەعلەت و نەفرین کردن لە خەڵکانی کافرو بێ باوەڕ ڕەوایە. ﴿ذلك بما عصوا وکانوا یعتدون﴾ چوون ئەوانە لەسنوور دەرچوون و پیشەیان هەر دەستدرێژی بوو ﴿٧٩ کانوا لا یتناهون عن منکر فعلوه﴾ و نەریتیشیان وابوو ڕێیان نەدەگرت لەوخراپەو تاوانانە دەیانکرد ﴿لبئس ماکانوا یفعلون﴾ ئای چ کارێکی زۆر خراپیان کرد ﴿٨٠ تری کثیرا منهم یتولون الذین کفروا﴾ زۆرێ لەودوورووە و جوولەکانە دەبینی، کە لەگەڵ خوانەناس و هاوبەشدانەرەکان پەیوەندی دەبەستن و دەبنە دۆست و پشتیوانیان ﴿لبئس ما قدمت لهم انفسهم﴾ ئای چ شتێکی خراپیان - بۆ پاشەڕۆژی خۆیان- پێشخست ﴿أن سخط الله علیهم﴾ کە ئەنجامەکەی ئەوە بوو: خوا توورە بوو لێیان ﴿و فی العذاب هم خالدون﴾ و لە سزایشدا بەهەتاهەتایی لەڕۆژی دواییدا دەمێننەوە ﴿٨١

﴿ولو كانوا يؤمنون بالله والنبي وما انزل إليه﴾ ئەر ئەوانە بەدڵ باوەڕیان بەخواو بەپەیامبەرو بەو بەرنامەیەی بۆی دابەزێنراوە هێنابا ﴿ما اتخذوهم أولياء﴾ ئەو كافرانەیان نەدەكردە دۆست و هاوڕێی خۆیان ﴿ولكن كثيرا منهم فاسقون﴾ بەڵام زۆربەیان تاوانبارو لە سنور دەچوون، بۆیە سەر لە هیچ شتێك ناكەنەوە.

**چەند رێنمایەك :**

١- زیادەڕەویی و داهێنان و كاری (بیدعە) لە ئاقیدەو خواپەرستیدا، كارێكی ناڕەواو حەرامە.

٢- ئەنجامی نافەرمانی خواو، دەستدرێژیی و، هەڵەرۆیی، بێ بەشبوونە لەڕەحمەتی خواو، زیانمەندیی و خۆ لەدەسدانە لەدنیاو لەقیامەت.

٣- بێ دەنگی بەرامبەر بە (مونكەر) و قسەو ڕەفتاری ناشەرعیی، كارێكی حەرامەو، ئەنجامیشی بەزیان دەشكێتەوە سەر كۆمەڵ و كۆمەڵگە بەگشتیی.

٤- بە دۆستگرتنی كافران و ئەهلی فەساد، كارێكی نەشیاوو ناپەسەندو قەدەغەیە.

٥- هاوكاری كردنی خوانەناس و بێ باوەڕان -دژ بە باوەڕداران- كوفرو لەدین دەرچوونە.

كۆتایی جزمی شەشەم

ولله الحمد و المنة

*** *** ***

**جوولەكەو موشریك سەر سەختانە دژایەتی موسڵمانان دەكەن:**

﴿[٨٢] لتجدن أشد الناس عداوة للذين آمنوا اليهود والذين اشركوا﴾ بێگومان جوولەكەو هاوبەشدانەرەكانت دەست دەكەوێت ئەی پێغەمبەر! كەپتر لەهەموو خەڵكانی تر، دژایەتی ئیماندارەكان دەكەن، چونكە دڵیان پڕە لەكینەو رك و ئێرەیی و عینادیی، لە كۆنیشەوە پیشەیان هەركوشتنی پێغەمبەران و بانگبەرانی ڕێی هەق بووە ﴿ولتجدن أقربهم مودة للذين آمنوا﴾ و بێگومان دەبینی و بۆت دەرئەكەوێ كە: بەسۆزترینی خەڵكانی جیهان بەرامبەر بەوانەی باوەڕیان هێناوە ﴿الذين قالوا إنا نصارى﴾ ئەوكەسانەن گوتیان: ئێمە نەساراو یاری عیساین، واتە: ئەمان لە یەهوود زۆر نزیكترن بەباوەڕدارەكانەوە لەلایەنی خۆشەویستیەوە ﴿ذلك بأن منهم قسيسين ورهبانا﴾ چونكە بڕێكیان قەشەو زانان و خواپەرست و رەبەن و گۆشەگیرن و، خۆیان یەكلا كردۆتەوە بۆخوا، هەردەم ئینجیل دەخوێننەوەو، دەزانن چ راستییەكی تێدایە ﴿وأنهم لا يستكبرون﴾ و فیزاوی نین و خۆ بەزلزان و دەعیەباز نازانین. (تەبەریی) دەڵێ: ئەم ئایەتی (وإذا سمعوا..) لەبارەی (نەجاشیی) و هاوەڵەكانیەوە هاتە خوارێ.

سەرنجێك: بەداخەوە خەڵكێكی زۆر وادەزانن ئەم ئایەتەی: (.. و لتجدن أقربهم مودة للذين آمنوا الذين قالوا إنا نصارى..) وەسف و سەنای (نەسارا)ی ئێستایەو، دەشكرێ بكرێنە براو دۆستی موسڵمانان، چونكە (بەلای ئەوانەوە) مەسیحیەكان وەك جوولەكە دژایەتی موسڵمانان ناكەن! دیارە ئەمە ڕاو بۆچوونێكی لاوازو هەڵەو ناتەواوە، چونكە قورئان زۆر بە توندیی ئاگادارمان دەكاتەوە كە هەرگیز جوولەكەو گاور نەكەینە دۆست ویارمەتیدەری خۆمان، وەك خوا خۆی دەفەرموێ: (ياأيهاالذين آمنوا لا تتخذوا اليهود والنصارى أولياء بعضهم أولياء بعض..) ٥١/٥. یان دەفەرموێ: (ولن ترضى عنك اليهود ولا النصارى حتى تتبع ملتهم..) ١٢٠/٢, وە مێژووی جەنگەكانی خاچپەرستەكان بەڵگەیەكی دیكەیە، ئینجا ئەم ئایەتی: (ولتجدن أقربهم مودة للذين آمنوا..) سەبارەت بەكۆمەڵێكی تایبەتی (نەصارا)ی حەبەشە هات، واتە: ئەوانە كە (نەجاشی) ناردنیە لای پەیامبەر ﷺ،

جاهەرکە گەیشتن، ئەویش بڕێ قورئانی بەسەردا خوێندنەوە، ئەوانیش خێرا ڕاستیەکانیان سەلماندو، بە کوڵ
دەستیان کردە گریان، وەك كۆتایی ئایەتەکەش ئەمە دەسەلمێنێ ودەفەرموێ: (وأنهم لا يستكبرون * وإذا سمعوا ما
أنزل إلى الرسول ترى أعينهم تفيض من الدمع مما عرفوا من الحق يقولون ربنا آمنا فاكتبنا مع الشاهدين). ﴿[٨٣] وإذا
سمعوا ما أنزل إلى الرسول﴾ هەرکە گوێیان لەو قورئانەوە دەبێ بۆ پەیامبەر ﷺ دابەزێنراوە ﴿ترى أعينهم تفيض من
الدمع﴾ ئەبینی ئەسرین لەچاویان دەڕژێ و، دڵیان ترسی خوای لێدەنیشێ و بەکوڵدەگرین ﴿مما عرفوا من الحق﴾
چونکە لەئاستی ڕاستیی و حەقیقەت چاك تێگەیشتوون و بۆیان دەرکەوتووەو ناسیویانە ﴿يقولون ربنا آمنا فاكتبنا
مع الشاهدين﴾ ئەوساش لەناخی دڵەوە ئەڵێن: پەروەردگارمان! ئێمە باوەڕمان هێنا بەو قورئانەی خۆت ناردت، سا
تۆیش لەگەڵ شایەتاندا ناومان بۆ ڕاستیی و هەقیانەتی
قورئان بنووسە ﴿[٨٤] وما لنا لا نؤمن بالله وما جاءنا من
الحق﴾ دەشڵێن: جاچیمانە باوەڕ بەیەکتاپەرستی خواو، بەو
ڕاستییەی لە قورئاندا هاتووە نەهێنین ؟! ﴿ونطمع ان
يدخلنا ربنا مع القوم الصالحين﴾ بەتەماشین پەروەردگارمان
لەگەڵ پیاوچاکاندا بمانباتە بەهەشت؟ ئیمامی (تەبەری)
دەڵێ: ئەم ئایەتی (و إذا سمعوا..) لەبارەی (نەجاشیی)
خۆیی و هاوەڵەکانیەوە هاتە خوارێ، ئەو دەمەی کە
(جەعفەری کوڕی ئەبوو تالیب) لە حەبەشە قورئانی بۆ
دەخوێندن، ئەوان تێر گریان و بەفرمێسك ڕیشیان تەڕبوو،
هەندێ ڕیوایەت دەڵێ: نەجاشی بۆ خۆی کەوتە ڕێ بێت
بۆلای پێغەمبەر، بەڵام لە ڕێگەدا کۆچی دوایی کردو مرد،
پێغەمبەریش ﷺ هەر لەمەدینەوە نوێژی لەسەر کرد ﴿[٨٥]
فأثابهم الله بما قالوا جنات تجري من تحتها الأنهار﴾ ئینجا
خواش لەبەرامبەر ئەوقسەوە کردیان و پاڕانەوە: بە چەندان
باخ و باخاتی بەهەشت، کە جۆگەو ڕووبارێکی زۆر بەخوڕ
بەبەریاندا دەڕوا پاداشتی دانەوە ﴿خالدين فيها﴾ و هەتا
سەریش تێیدا ئەمێننەوە ﴿و ذلك جزاء المحسنين﴾ و ئەوەش پاداشتی گشت کارچاکانە ﴿[٨٦] والذين كفروا وكذبوا
بآياتنا﴾ ئەوانەش کە نکووڵیی یەکتاپەرستییان کردو باوەڕیان بەنیشانەو ئایەتەکانی ئێمە نەبوو ﴿اولئك اصحاب
الجحيم﴾ ئەوانە هاوەڵی ئاگری دۆزەخن و، لێی دوورناکەونەوە.

الجزء السابع — سورة المائدة

وَإِذَا سَمِعُوا مَا أُنزِلَ إِلَى الرَّسُولِ تَرَىٰ أَعْيُنَهُمْ تَفِيضُ مِنَ
الدَّمْعِ مِمَّا عَرَفُوا مِنَ الْحَقِّ يَقُولُونَ رَبَّنَا آمَنَّا فَاكْتُبْنَا مَعَ
الشَّاهِدِينَ ﴿٨٣﴾ وَمَا لَنَا لَا نُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَمَا جَاءَنَا مِنَ الْحَقِّ
وَنَطْمَعُ أَن يُدْخِلَنَا رَبُّنَا مَعَ الْقَوْمِ الصَّالِحِينَ ﴿٨٤﴾ فَأَثَابَهُمُ
اللَّهُ بِمَا قَالُوا جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا
وَذَٰلِكَ جَزَاءُ الْمُحْسِنِينَ ﴿٨٥﴾ وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا
بِآيَاتِنَا أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ ﴿٨٦﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا
لَا تُحَرِّمُوا طَيِّبَاتِ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوا إِنَّ اللَّهَ
لَا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ ﴿٨٧﴾ وَكُلُوا مِمَّا رَزَقَكُمُ اللَّهُ حَلَالًا طَيِّبًا
وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي أَنتُم بِهِ مُؤْمِنُونَ ﴿٨٨﴾ لَا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ
بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ الْأَيْمَانَ
فَكَفَّارَتُهُ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ
أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ
ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ ذَٰلِكَ كَفَّارَةُ أَيْمَانِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ وَاحْفَظُوا
أَيْمَانَكُمْ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٨٩﴾

١٢٢ — يا أيها الذين

## ڕێنماییەکانی ئایەتی (٨٢-٨٦):

١- دژایەتی یەهوودو موشریکان بەرامبەر بە ئیسلام و موسڵمانان.

٢- (نەسارا) ڕاست بێژەکانیان بە موسڵمانانەوە نزیکن.

٣- فەزیلەتی خۆ بەکەمزانین و، بێ فەڕی خۆ بەزلزانین.

٤- ئەم ئوممەتە فەزڵ و ڕێزی بەسەرئوممەتانی تردا هەیە.

٥- خاوەننامەکان کاتێ فەزڵیان ئەبێ کە بەڕاستیی موسڵمان بن.

٦- ئەنجام و چارەسەری کافران و بەدرۆ خەرەوان هەر دۆزەخە.

## گۆشەگیریی و رەبەنیەت لە ئیسلامدا پەسەند نییە:

(بوخاریی) لە (ئیبن عەباس)ەوە- خوالێیان رازی بێت- دەڵێت: هەندێ لە هاوەڵان، ژنهێنان و گۆشتخواردنیان لەخۆ حەرامکردو، تەنانەتی وتیان: ئامێری پیاوەتیمان دەبڕین و واز لەدنیا دێنین و خۆمان دەکەینە گەڕۆك و سەیاح و، گۆشەگیرو رەبەن، ئینجا خوا ئەم ئایەتەی نارده خوارەوەو فەرمووی: ﴿[٨٧] یاأیها الذین آمنوا لا تحرموا طیبات ماأحل الله لکم﴾ ئەی ئەوکەسانەی باوەڕتان هێناوە! ئەو شتە پاکانە خوا رەوای داون بۆتان بەناوی زوهدو خواناسییەوە لەخۆتانی حەرام مەکەن ﴿ولاتعتدوا إن الله لایحب المعتدین﴾ لەرادەش تێمەپەڕن و بەسەر سنوورەکانی خوادا دەستدرێژیی مەکەن، چ لەحەڵاڵدا، چ لەحەرامدا، واتە: جل و بەرگی جوان و، خواردن و خەوو ئیسراحەت و، هاوسەریی ژنان لەخۆ حەرام مەکەن، چونکە ڕۆح و چاوو گوێ و، ماڵ و خێزان و میوان و خزمان، هەقیان لەسەرتانەو، دەست هەڵگرتن لەمانە زیادەڕەویی وسنوور بەزانە، دڵنیاشبن خوا خەڵکانی سنوور دەرچووی خۆش ناوێ ﴿[٨٨] وکلوا مما رزقکم الله حلالا طیبا﴾ دەسا ئێوە لەو رسق و رۆزیە پاك وحەڵاڵ و خاوێنە، خوا پێیداون بخۆن و، لەخۆتانی قەدەغە مەکەن ﴿واتقوا الله الذی انتم به مؤمنون﴾ و لە نافەرمانی ئەو خوایە بترسن، باوەڕتان پێی هەیە.

## کەفارەت و بارتەقای سوێند:

﴿[٨٩] لایؤاخذکم الله باللغو فی ایمانکم﴾ خوا بەسوێندی سەرزارەکیی و بێ مەبەست و بێ نیاز , وەك بڵێیت (نا والله ، بەڵێ والله) نا تانگرێ و جەزرەبەتان نادا ﴿ولکن یؤاخذکم بما عقدتم الأیمان﴾ بەڵام بەو سوێندانە دەتانگرێ و سزاتان دەدا، کە بەدڵ گرێیان دەدەن و لەناخی دڵتانەوەن و نایشیانبەنە سەر ﴿فکفارته إطعام عشرة مساکین﴾ جا دەبێ لە کەفارەتی ئەم جۆرە سوێندانەدا خۆراك بە دەکەسی بێ نەواو هەژاربدەن ﴿من أوسط ما تطعمون اهلیکم﴾ لەو خۆراکە مام ناوەندیە, کە ئێوە رۆژانە بەماڵ و منداڵ و خێزانی خۆتانی دەدەن ﴿او کسوتهم﴾ یان دەبێ دەهەژار پۆشتە بکەن ﴿اوتحریر رقبة﴾ یان دەبێ کۆیلەیەك ئازاد بکەن ﴿فمن لم یجد فصیام ثلاثة أیام﴾ ئینجا هەرکەسێك ئەوانەی نەبوو، دەبێ سێ رۆژان بە رۆژوو بێ ﴿ذلك کفارة أیمانکم إذا حلفتم﴾ ئەوسێ جۆرەیە باسکران, کەفارەت و تۆڵەی ئەوسوێندانەیە بەئەنقەست خواردوتانن ودەیانشکێنن ﴿واحفظوا أیمانکم﴾ دەسا سوێندەکانتان ڕاگرن و بیانپارێزن، بەناچاری نەبێت مەیانشکێنن ﴿کذلك یبین الله لکم آیاته﴾ ئا بەوشێوەیەخوا یاساکانی خۆی ڕووندەکاتەوە بۆتان ﴿لعلکم تشکرون﴾ بەشکو سوپاسگوزاری پەروەردگارتان بکەن.

تێبینی: مرۆڤ لەوکەفارەتەدا (موخەییەر) و سەرپشکە، هەرکامێکیان هەڵبژێرێ دەتوانێ. پۆشاکیش: ئەوی لەناوخەڵکانی ماقووڵدا پێی بڵێن (پۆشاك) دەبێ. خۆراکەکەش: یان دەبێ (٦٠٠) گرام بێت، یان دەبێ نرخەکەی بدات، رۆژووەکەش: مەرج نیە هەر سێ رۆژەکە بەسەریەکەوە بێت.

رێنمایەکانی ئایەتی (٨٧-٨٩):

١- حەرامکردنی حەڵاڵ و، حەڵاڵکردنی حەرام، لە موسڵمان ناوەشێتەوە.

٢- کەم وێنەیی سووربوونی هاوەڵان لەسەر خوا پەرستیی.

٣- زیادەڕەویی و (غلو) و لەدینیشدا حەرامە.

٤- دەبێ کەفارەتی سوێند پاش خستنی بدرێت.

٥- زۆر سوێندخواردن، ئەگەر لەسەر هەقیش بێ کارێکی ناپەسەندو(مەکروه)ە.

٦- سوێند بەغەیرەز خوا حەرامە، بە بەڵگەی ئەم فەرموودە پێغەمبەر فەرموویەتی: ((مَنْ حَلَفَ بِغَيْرِ اللهِ فَقَدْ أَشْرَكَ أو كَفَرَ)) ترمزی ریوایەتی کردووە. یان دەفەرموێ: ((ألا إن الله ينهاكم أن تحلفوا بآبائكم، فمن كان حالفاً فَلْيَحْلِفْ بالله أو لِيَصْمُتْ)).

٧- سوێند خواردن بۆکردنی هەرکارێکی (مەندوب)، یان بۆ رێگرتن لەهەرکارێکی ناپەسەندو (مەکروه)، لە شەریعەتی ئیسلامدا رێی پێدراوە بشکێندرێ و، کەفارەتی بدرێت، ئەگەر بەرژەوەندی لەوەدابوو، بەڵام ئەگەر سوێندەکە بۆ تەرکی (واجیب)ێك بوو، یان بۆ کردنی (حەرام)ێك بوو، ئەوە لەم حاڵەتەدا خستنەکەی واجیبە.

٨- سوێند سێ جۆری هەیە: یەکەم: سوێندی (باتڵ / لەغوو) ئەوە کەفارەتی بۆ نادرێ، وەکو ئەوە کەسێك بڵێ: (ئەرێ وەڵڵا، ناوەڵڵا) جا لەبەرئەوە کە ئەم جۆرە سوێنانە لەناخی دڵەوە نایەن، نەگوناحیان هەیەو نەکەفارەت، دووەم: سوێندی درۆو (غەمووس): واتە: درۆکردن و سوێند خواردن، بەدەس ئەنقەس، ئەم جۆرەشیان لەبەر گەورەیی گوناح و تاوانەکەی، کەفارەتی نیە، مەگەر هەرتەنها تەوبە لای ببا. سێ یەم: سوێندێکە کەفارەتی بۆ دەدرێ، ئەمەیش ئەوەیە کەکەسێك بەدەس ئەنقەس سوێند ئەخوا بۆ کردنی کارێك یا بۆ نەکردنی، لەپاشان سوێندەکەی ئەشکێنێ، دیارە ئەم جۆرە سوێندەیان لەم سوورەتەدا باسکراوە. ئیمامی (بوخاریی) لەبارەی سوێندی (غەمووس)ەوە ئەم فەرموودەیە ی هێناوە: ((أن النبی ﷺ سأله أعرابی قائلا يا رسول الله: ماالكبائر؟ قال : الإشراك بالله، قال : ثم ماذا ؟ قال: عقوق الوالدين، قال: ثم ماذا ؟ قال: اليمين الغموس..قلت وما اليمين الغموس؟ قال: التی ينقطع بها مال امریء مسلم هو فيها كاذب)) واتە: سوێندی (غەمووس) یەکێکە لە تاوانە گەورەکان و لەبەر گەورەیی گوناحەکەی کەفارەتی بۆنادرێ، دەسا ئێوە خۆتانی لێ لادەن.

**شەرا بخۆریی و قومار بازیی:**

﴿٩٠ يا أيها الذين آمنوا إنما الخمر والميسر﴾ ئەی گەلی خاوەن باوەڕ! بێگومانبن کەعارەق خۆریی (مەشرووبات) و قومار بازیی و کاغەزی (یانصیب) ﴿والأنصاب والأزلام﴾ وئەو بەردەی حەیوانی بتەکانی لەسەر، سەر دەبڕێ بۆ بتەکان و، فاڵگرتنەوە بۆ دەرکەوتنی بارێکی چاك، یان خراپ ،یان بۆ تاقیکردنەوەی بەخت، وەك عادەت و باو بوو﴿رجس من عمل الشيطان﴾ ئەمانە گشت پیسن و لەکاری شەیتانن ﴿فاجتنبوه لعلكم تفلحون﴾ دەسا ئێوە خۆتانی لێ دووربگرن، تا بەڵکو لە دنیاو لەقیامەتدا ڕزگارو بەختەوەربن ﴿٩١ إنما يريد الشيطان أن يوقع بينكم العداوة والبغضاء فی الخمر والميسر﴾ شەیتان هەر ئەیەوێ بەشەرابخواردن و قوماركردن، دوژمنایەتیی وقین بخاتە ناوتان ﴿ويصدكم عن ذكرالله وعن الصلاة﴾ و لەیادی خواو لە نوێژکردن رێتان لێ بگرێ و، وەرتانگێرێ ﴿فهل انتم منتهون﴾ ئاخۆ ئیتر ئێوە لەو کارانە دەسبەردار دەبن؟ واتە: دەبێ لەوشتانە دەست هەڵبگرن کە: خوا حەرامی کردون ، بەڵێ کاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە بە پەلە هاوەڵان وتیان: پەروەردگارمان! ئەوا دەستمان لە هەموو ئەو شتانە هەڵگرت، دەستمان هەڵگرت بەهەتاهەتایی! پاشان هەر عارەقێکیشیان هەبوو خێرا رشتیان. (ئەبووهەرەیرە خوای لێ رازی بێت دەڵێ : ئەودەمە کە پێغەمبەر ﷺ هاتە مەدینە، خەڵکەکەی سەرگەرمی مەشرووبات و قوماركردن بوون، ئەوسا لەپێغەمبەریان ﷺ پرسی: ئاخۆ ئەمانە حەرام بن، یان نا؟ جابۆ ئەو وەڵامە ئەم ئایەتەی سوورەتی (بەقەرە)یە هات و فەرمووی: (يسئلونك عن الخمر و الميسر قل فيهما إثم كبير و منافع للناس ..) بەڵام ئەو

کۆمەڵگەیە لەبەرئەوە کە خوا فەرموو بووی: ((فیهما إثم کبیر ..)) وا حاڵی ببوون کەهێشتا حەرام نەکراوە، بۆیە هەر کۆڵیان نەدا لێیان، هەتا ڕۆژێك پیاوێکی مەست و سەرخۆش بەر نوێژی دەکردو، لەپێش نوێژییەکەدا قورئانەکەی شێواندو تێکەڵی کرد! ئیتر ئایەتێك لەوە توندتر هات و فەرمووی: (یاأیهاالذین آمنوا لا تقربوا الصلاة وأنتم سکاری حتی تعلموا ما تقولون ..) پاش ئەم ئایەتەش خەڵکەکە هەر دەیان خواردەوە، بەڵام هەوڵیان دەدا نەکەوێتە کاتی نوێژەکانەوە، دیسان خوای گەورە ئایەتێکی سەختتری ناردو فەرمووی: (یاأیها الذین آمنوا إنما الخمر و المیسر و الأنصاب و الأزلام رجس من عمل الشیطان فاجتنبوه لعلکم تفلحون) ئیتر ئەوسا براوبڕ دەستیان لێهەڵگرت، پێشەوا ئەحمەد. کەوابوو حەرام بوونی مەشروبات و قومار بە سێ قۆناغدا تێپەڕیوە. ﴿[٩٢] واطیعوا الله واطیعوا الرسول واحـذروا﴾ و دەبـێ بـە بـەردەوام گوێڕایـەڵی خـوا بـن و، بەرفـەرمانی پەیامبـەربن و، وریاشـبن هەمیشـە لەوشـتە ناپەسـەندانە دوور بگـرن ﴿فـإن تـولیتم﴾ جا ئەگـەر لەقسـەم دەرچوون و، ڕووتـان لـە ئامۆژگارییەکانم وەرگێـڕا ﴿فاعلموا انما علی رسولنا البلاغ المبین﴾ ئەبی بزانن کـە بەڕاستیی پەیامبـەر جگەلـە ڕاگەیانـدنی پـەیامی خـوا هیچـی تـری لەسـەرنییە، سـزاو تۆڵـەیش هەربەدەسـتی خوایـە. (ئـیبن عـەبباس) دەڵێـت: کـاتێ ئایـەتی حـەرامکردنی ئـارەق هـات، هاوەڵان وتیان: ئەی پەیامبەری خوا ﷺ ! باشە! ئەوانەمان کە ئارەق خـۆر بـوون وئێسـتا مردوون چی بکـەن ؟! جا بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە- وەکو(ئیبن جـەریر) دەڵـێ ئـەم ئایەتە هـات وفـەرمووی: ﴿[٩٣] لـیس علـی الـذین آمنـوا وعملـوا الصـالحات جنـاح فیمـا طعمـوا﴾ بـۆ ئەوانـەی وا ئێسـتا باوەڕیان هێناوەو ئاکارچاکن، پێشتریش "پێش حەرام بونی مەشـرووبات" خواردوویانەتـەوە، هـیچ گوناهێکیـان لەسـەر نییـە ﴿إذا مـا اتقـوا وآمنـوا وعملـوا الصـالحات﴾ بەمـەرجێ ئێسـتا خـۆ پـارێزبن و، باوەڕیـان هـەبێ و کـردەوەی چـاك ئەنجام بدەن ﴿ثم اتقوا وآمنوا﴾ بۆ دوا ڕۆژیش لە خوا پارێزبکـەن و، لەسـەر ئیمانە کـەیان توکمـەو تـابتن ﴿ثـم اتقوا واحسنوا﴾ لە پاشا هـەر پارێزکارو چاکەکاربن و، هەمیشـەیش لەهەوڵدابن بۆ نزیکبوونەوە بە خواوە ﴿والله یحب المحسنین﴾ وخوا ئاکارچاکانی خۆش ئەوێ. بەڵێ هـەر لەبەر گرنگـی تـەقواو ئیمان بوو، کە ئەوەندە جار خوای گەورە لەئایەتەکەدا هەردووکیانی دووپات کردەوە.

الجزء السابع — سورة المائدة

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ
مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٩٠﴾ إِنَّمَا يُرِيدُ
ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيۡنَكُمُ ٱلۡعَدَٰوَةَ وَٱلۡبَغۡضَآءَ فِي ٱلۡخَمۡرِ وَٱلۡمَيۡسِرِ
وَيَصُدَّكُمۡ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِۖ فَهَلۡ أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴿٩١﴾ وَأَطِيعُواْ
ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَٱحۡذَرُواْۚ فَإِن تَوَلَّيۡتُمۡ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا عَلَىٰ
رَسُولِنَا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ﴿٩٢﴾ لَيۡسَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ
ٱلصَّٰلِحَٰتِ جُنَاحٞ فِيمَا طَعِمُوٓاْ إِذَا مَا ٱتَّقَواْ وَّءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ
ٱلصَّٰلِحَٰتِ ثُمَّ ٱتَّقَواْ وَّءَامَنُواْ ثُمَّ ٱتَّقَواْ وَّأَحۡسَنُواْۚ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ
﴿٩٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَيَبۡلُوَنَّكُمُ ٱللَّهُ بِشَيۡءٖ مِّنَ ٱلصَّيۡدِ تَنَالُهُۥٓ
أَيۡدِيكُمۡ وَرِمَاحُكُمۡ لِيَعۡلَمَ ٱللَّهُ مَن يَخَافُهُۥ بِٱلۡغَيۡبِۚ فَمَنِ ٱعۡتَدَىٰ بَعۡدَ
ذَٰلِكَ فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٩٤﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡتُلُواْ ٱلصَّيۡدَ
وَأَنتُمۡ حُرُمٞۚ وَمَن قَتَلَهُۥ مِنكُم مُّتَعَمِّدٗا فَجَزَآءٞ مِّثۡلُ مَا قَتَلَ مِنَ ٱلنَّعَمِ
يَحۡكُمُ بِهِۦ ذَوَا عَدۡلٖ مِّنكُمۡ هَدۡيَۢا بَٰلِغَ ٱلۡكَعۡبَةِ أَوۡ كَفَّٰرَةٞ طَعَامُ
مَسَٰكِينَ أَوۡ عَدۡلُ ذَٰلِكَ صِيَامٗا لِّيَذُوقَ وَبَالَ أَمۡرِهِۦۗ عَفَا ٱللَّهُ عَمَّا
سَلَفَۚ وَمَنۡ عَادَ فَيَنتَقِمُ ٱللَّهُ مِنۡهُۚ وَٱللَّهُ عَزِيزٞ ذُو ٱنتِقَامٍ ﴿٩٥﴾

١٢٣

ڕێنمایەکانی ئایەتی (٩٠-٩٣):

١- هەمووجۆرە عارەق و مەشروباتێ، لەگەڵ جۆرەکانی قومارو فاڵگرتنەوەو کتێب گرتنەوەو هەمووجۆرە فرووفێڵێکی تر لەو بابەتە قەدەغەو حەرامە.

٢- پێویستە بەزوویی دەست لەوشتانە هەڵ بگیردرێ، وەکو هاوەڵان زۆر بەتالووکە وتیان: (إنتهینا یاربنا)!

٣- عەرەق و قومار دووکاری ناپەسەندن و، دژایەتیی و خشم و قین لە نێوان (مەشرووب) خۆران و یاریکەراندا دروست دەکەن، ئیتر ڕێ لەیادی خوا گرتن و دوورخستنەوەیان لەنوێژ لە باس نایە .

٤-جێبەجێ کردنی فەرمانی خواو فەرمانی پێغەمبەر ﷺ واجیبە.

٥- دەبێ ئێمە گشتمان تامردن تەقواو پارێزمان هەبێ.

٩٤ ﴿ یا أیهاالذین آمنوا لیبلونکم الله بشئ من الصید﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! خوا بەشتێك لە نێچیریی وشکانی لەکاتی ئیحرامدا تاقیتان دەکاتەوە کە دێتە بەر دەستتان ﴿تناله أیدیکم و رماحکم﴾ کە زۆر بەئاسانی بەدەست و بە نێزەکانتان دەتوانن ڕاوی بکەن، دیارە کە ڕاوی ئەوجۆرە نێچیرانە بەبەرگی (ئیحرام)ەوە حەرامە، کەچی کە لە حودەیبییەدا بوون نێچیرەکان ئەهاتنە نزیکی بارو بارەگاکانتانەوەو زۆریش بەئاسانی دەتانتوانی بیانگرن، یان بیانکوژن، بەڵام چونکە لە بەرگی ئیحرامدا بوون خوای گەورە بۆ تاقیکردنەوە لێی یاساغکردن ﴿لیعلم الله من یخافه بالغیب﴾ تا دەرکەوێ چ کەسێ بەپەنامەکی و بە نهێنیش لەخوا ئەترسێ و، لە حەرامەکانی دوور ئەکەوێتەوە ﴿فمن اعتدی بعد ذلك﴾ ئینجا هەرکەسێك پاش ئەوئاگاداریە سەرپێچی و دەست درێژیکرد ﴿فله عذاب ألیم﴾ سزایەکی ئێش پێگەیەنەری بۆ هەیە.

**نێچیر کوشتن لەئیحرامدا حەرامە :**

٩٥ ﴿ یاأیها الذین آمنوا﴾ ئەی ئەوکەسانەی باوەڕتان هێناوە! ﴿لاتقتلوا الصید وأنتم حرم﴾ هەتا لە ئیحرامدان هیچ جۆرە نێچیرێکی وشکانی مەکوژن، گۆشتی بخورێ، یانەخورێ ﴿ومن قتله منکم متعمدا﴾ هەرکەسێکتان بەدەست ئەنقەست کوشتیی و لەئیحرامیشدا بوو، بەڵام لەم گیانلەبەرو جانەوەرانە نەبوو کە ناویان لەبوخاریی و، موسلیمدا هاتووە: ((خمس فواسق یقتلن فی الحل والحرم : الغراب، والحدأة، والعقرب، والفأرة، والکلب العقور)) واتە: ئەم پێنج شتە گشت کاتێ لەحەرەم و لەدەرەوەیدا کوشتنیان مۆڵەتی پێدراوە: قەلەڕەشە، داڵە کوڵارە، دووپشك، مشك، سەگی لاگیر ﴿فجزاء مثل ما قتل من النعم﴾ لە تۆڵەی ئەوەدا دەبێ وێنەی نێچیرە کوژراوەکە لەمەڕو بزن و وشترو گا کەفارەت بدات ﴿یحکم به ذوا عدل منکم﴾ دووکەسی دادگەرێ زاناشتان بڕیاری لەسەربدەن وبڵێن: ئەمە بۆبارتەقاو کەفارەتی نێچیرە کوژراوەکە دەشێ ﴿هدیا بالغ الکعبة﴾ ئەوکەفارەتە بهێنێتە هەرێمی کابەو هەرلەوێش سەری ببڕێ و، بیداتە هەژاران ﴿أوکفارة طعام مساکین﴾ یان لەجێی قوربانیە کە ئەگەر هاووێنەی حەیوانە کوژراوەکە نەبوو خواردن بدرێ بەخەڵکانی بێنەواو هەژار، هەر هەژارەی مشتێ خۆراك ﴿أو عدل ذلك صیاما﴾ یان بەئەندازەی قیمەتی ئەونێچیرەچەندرۆژ یك بە ڕۆژوو بن، واتە:دەبێ حەیوانە کوژراوەکەبکرێ بە پارەو، ئەو پارەیە چەندە خواردن بکات، لە باتی هەر مشتەی ڕۆژێك بە ڕۆژوو بن ﴿لیذوق وبال أمره﴾ تاتۆڵەی ئەوسەرپێچییەی خۆیە بچێژێ ﴿عفاالله عما سلف﴾ خوا لەکاری سەردەمی نەفامیی و پێش ئەم قەدەغە کردنەیە خۆش بووە ﴿ومن عاد فینتقم الله منه﴾ ئینجا کەسێك بچێتەوە سەرباری نێچیر کوشتن دوای حەرام بوونی، خوا تۆڵەی لێدەکاتەوە ﴿والله عزیز ذو انتقام﴾ چونکە خوا زۆربە دەسەڵات و، تۆڵە سێنە، هەرکەسێك لەفەرمانەکانی سەرپێچی بکات ، زۆر بەئاسانی دەتوانێ تۆڵەی لێ بسێنێ.

**ڕاوی دەریا بەئیحرامەوە دەکرێت :**

٩٦ ﴿ أحل لکم صید البحر وطعامه﴾ هەموو جۆرە نێچیرو خواردەمەنیەکی دەریاکانتان بۆ ڕەوایە ، ئیتر لە ئیحرامدا بن، یان نا ﴿متاعا لکم وللسیارة﴾ تا ببێتە بژێوی ئێوەو، ڕێبواران و، هەمووکاتێ کەڵکی لێوەرگرن ﴿و

حرم عليكم صيد البر ما دمتم حرما﴾ وهەتا لە بەرگی ئیحرامیشدا بن ،راوی وشکانی قەدەغەو یاساغە بۆتان ﴿واتقوا الله الذی إليه تحشرون﴾ دەبێ لەو خوایە بترسن کە دەبرێنەوەلای ئەوو، لەبەر دەست ئەودا کۆدەکرێنەوەو، پاداشتان ئەداتەوە .

رێنمایەکانی ئایەتی (٩٥-٩٦):

١- کاتێ هاوەڵان لە(حودەیبیە) بوون، نێچیرێکی زۆرو زەبەنە لەبەر دەسترەسیاندا دەهات و دەچوو، ئەوسا خوای میهرەبان بۆ تاقییکردنەوەیان حەرامیکرد کە بەهیچ جۆرێ دەستی بۆبەرن، جا ئەوانیش بە هەقیانەت فەرمانەکەیان جێبەجێ کرد، لەمەیشدا زۆر لە (بەنی ئیسرائیل)یەکان گوێڕایەڵتر و باشتر هاتنە مەیدان.

الجزء السابع سورة المائدة

أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ الْبَحْرِ وَطَعَامُهُ مَتَاعًا لَّكُمْ وَلِلسَّيَّارَةِ وَحُرِّمَ
عَلَيْكُمْ صَيْدُ الْبَرِّ مَا دُمْتُمْ حُرُمًا وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي إِلَيْهِ
تُحْشَرُونَ ﴿٩٦﴾ ۞ جَعَلَ اللَّهُ الْكَعْبَةَ الْبَيْتَ الْحَرَامَ
قِيَامًا لِّلنَّاسِ وَالشَّهْرَ الْحَرَامَ وَالْهَدْيَ وَالْقَلَائِدَ ذَٰلِكَ لِتَعْلَمُوا
أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَأَنَّ اللَّهَ بِكُلِّ
شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴿٩٧﴾ اعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ وَأَنَّ اللَّهَ
غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٩٨﴾ مَّا عَلَى الرَّسُولِ إِلَّا الْبَلَاغُ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا
تُبْدُونَ وَمَا تَكْتُمُونَ ﴿٩٩﴾ قُل لَّا يَسْتَوِي الْخَبِيثُ وَالطَّيِّبُ
وَلَوْ أَعْجَبَكَ كَثْرَةُ الْخَبِيثِ فَاتَّقُوا اللَّهَ يَا أُولِي الْأَلْبَابِ
لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿١٠٠﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَسْأَلُوا
عَنْ أَشْيَاءَ إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ وَإِن تَسْأَلُوا عَنْهَا حِينَ يُنَزَّلُ
الْقُرْآنُ تُبْدَ لَكُمْ عَفَا اللَّهُ عَنْهَا وَاللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴿١٠١﴾ قَدْ
سَأَلَهَا قَوْمٌ مِّن قَبْلِكُمْ ثُمَّ أَصْبَحُوا بِهَا كَافِرِينَ ﴿١٠٢﴾
مَا جَعَلَ اللَّهُ مِن بَحِيرَةٍ وَلَا سَائِبَةٍ وَلَا وَصِيلَةٍ وَلَا حَامٍ وَلَٰكِنَّ
الَّذِينَ كَفَرُوا يَفْتَرُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ وَأَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿١٠٣﴾

١٢٤ وإذا قيل

٢- بە بەرگی ئیحرامەوە راوکردن و نێچیر گرتن بەدەر لەنێچیری دەریایی حەرامە، کوشتنی ئەو جانەوەرە بەئازارانە نەبێ، (وەك مارو دووپشك و قەلەرەشەو مشك و شێرو پڵنگ و گورگ و.. هتد) ئەمانە چ بە ئیحرامەوە و، چ بەغەیری ئیحرامەوە، لە (حەرەم) و، لە دەرەوەیشیدا مۆڵەت بە کوشتنیان دراوە، ئەم فەرموودەی: ((خمس فواسق يقتلن فی الحل و الحرم: الحية، والغراب الأبقع، و الفأرة، و الكلب العقور، والحدأة)) هەر ئەو راستییە دەڵێ . ﴿[٩٧] جعل الله الكعبة البيت الحرام قياما للناس﴾ خوای دلۆڤان کابە (بیت الحرام)ی کردۆتە هۆی پایەدار بوون و سەقامگیربوون بۆ ژیانی مەردم لە هەردوو جیهاندا، ئەوەتە لە دونیادا بۆتە جێگەی ئاسایش و نیعمەت و خۆشگوزەرانی، بۆ خەڵکانی لاواز و بێ دەسەڵات بەتایبەتی، بۆ دوارۆژیش نیشانەی بەختیاریی موسڵمانانە ﴿والشهرالحرام﴾ مانگە حەرامەکانیشی گێڕاوە بەهۆی ژیان وئیسراحەت بۆیان، چونکە مانگە قەدەغە کراوەکان ئاژاوەو جەنگیان تێدا قەدەغە کراوەو خەڵکان دەحەوێنەوە ﴿وَالْهَدْيَ وَالْقَلَائِدَ﴾ قوربانی بێ نیشانەو، نیشانەداریش هەروا، واتە: ئەو وشترانەیش کە گەردنبەند دەکرێتە ملیان و ئامادە دەکرێن بۆ خوا ﴿ذلك لتعلموا ان الله يعلم ما فی السموات وما فی الأرض﴾ ئەوەش هەتا بزانن کە: هەرچی لەناو ئاسمانەکان و زەویدایە ، خوای گەورە پێی دەزانێ ﴿وان الله بكل شئ عليم﴾ وە بە هەمووشتێکیش بەئاگایە، خۆی چاك ئەزانێ چی باشە بۆژیان ومانەوەیان ﴿[٩٨] إعلموا ان الله شديد العقاب﴾ دەبێ ئەوەش بزانن کە بە راستیی خوا لە سزاداندا زۆر توندو سەختگیرە بۆکەسێ لەبریارەکانی سەرپێچی بکات ﴿وان الله غفور رحيم﴾ بێگومانیشبن کە هەر خوایە تاوان پۆشە، دلۆڤان و میهرەبانە ﴿[٩٩] ما على الرسول إلا البلاغ﴾ ئەرکێ لەسەر پەیامبەرە ﷺ، هەر گەیاندنی پەیامەکەی خوایە ﴿والله يعلم ما تبدون وما تكتمون﴾ ئیتر خوا بۆخۆی لەوشتانە ئێوەبە ئاشکرا دەیکەن و، لەوانەش بەنهێنی دەیکەن و ئەیشارنەوە زاناو ئاگادارە.

**پرسیاری بێ جێ و نەشیاو مەکەن:**

﴿<sup></sup>[۱۰۰] قل لا یستوی الخبیث والطیب﴾ بڵێ: پیس وپاك، چاك و خراپ، حەڵاڵ و حەرام، وەك یەك نین لای خوا ﴿ولو اعجبك كثرة الخبیث﴾ ئەگەر چی زۆرایی ماڵە پیس و خراپە کەش سەرسامت بکا، چونکە ماڵ و سامانێکی حەڵاڵ و کەم، زۆر باشترە لەماڵێکی زۆری حەرام، وەکو دەفەرموێ: ((ما قل و کفی، خیر مما کثر و الهی)) واتە: کەمێکی خود کەفاف، زۆر باشترە لەزۆرێکی سەرقاڵکەر ﴿فاتقوا الله یا أولی الألباب﴾ جا کەوابوو گشتتان هەر لەخوا بترسن، ئەی خاوەنانی عەقڵ و ژیریی! ﴿لعلکم تفلحون﴾ تابەشکو لەدنیاو لەقیامەتدا بەختیارو سەرفراز بن. لەم ئایەتانەی خوارەوە خوای گەروە وێڵ و ئەدەبێ موسڵمانان دادەدا و ڕێبیان لێدەگرێ کە پرسیار لە هەندێ شت بکەن کەڵك و سوودی تیا نەبێت بۆیان، بۆنموونە ئەیان پرسی: باوکم کێیە؟ یان وشترەکەی گوم دەبوو ئەیوت: وشترەکەم لەکوێیە؟ جا بۆ سەرزەنشتکردنیان (وەکو بوخاریی ریوایەتی دەکات) خوا فەرمووی: ﴿[۱۰۱] یا ایهاالذین آمنوا لا تسألوا عن اشیاء ..﴾ ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە! لەو شتانە لە پەیامبەر ﷺ مەپرسن ﴿إن تبد لکم تسؤکم﴾ کە ئەگەر بۆتان ڕوون بکرێتەوە غەمبارو ناڕەحەت دەبن ﴿وإن تسألوا عنها حین ینزل القرآن﴾ ئەگەریش پرسیارەکە هەڵگرن بۆ ئەوکاتەی قورئان بێتە خوارەوە ﴿تبدلکم﴾ ئەوسا وەڵامەکەتان بۆ شیی بکرێتەوە، لەوانەیە تووشی ناڕەحەتی ببن، کەوابوو لەو جۆرە شتانە پرسیار مەکەن، نەوەك بەنتان توند بکرێتەوە، لە فەرموودەیەکی (متفق علیە)دا هاتووە کە: گەورەترین گوناهی موسڵمان لەوەوە پەیدا دەبێت لەشتێك بپرسێت و حەرام نەکرابێت، کەچی بەبۆنەی پرسیارەکەی ئەوەوە حەرام بکرێت ﴿عفا الله عنها﴾ خوای دلۆڤان لەو جۆرە پرسیارە ناپەسەندەی پێشووتان بوورا ﴿والله غفور حلیم﴾ چونکە خوا بۆ خۆی هەمیشە لێبوردەیە، زۆریش لەسەرخۆو هێمن و پەلە نەکەرە لەسزاو تۆڵەدا ﴿[۱۰۲] قد سألها قوم من قبلکم﴾ خۆ خەڵکانێك یش بەر لەئێوە پرسیاریان لەوجۆرە شتانە کرد ﴿ثم اصبحوا بها کافرین﴾ پاشان کە وەڵام درانەوە کافر بوون پێیان و ڕەفتاریان پێ نەکرد، بۆ نموونە: گەلەکەی صالح ﷺ، داوای وشترەکەیان لێکردو پاشانیش باوەڕیان پێ نەهێنا!

**تەفسیری بەحیرەو سائیبەو وەصیلە:**

﴿[۱۰۳] ماجعل الله من بحیرة ولا سائبة ولا وصیلة ولا حام﴾ خوا لەم چوار جۆرە وشترە: (بەحیرە، سائیبە، وەصیلە، حام) کەڵك وەرگرتنی حەرام نەکردووە، بەڵێ هەر وشترێك پێنج سکی کردباو، ئاخرەکەیان نێر بووبا، هەڵدەسان گوێیان کون ئەکردو بەرەڵایان دەکردو نەیاندەهێشت کەس باری لێ بنێ، وە یان سواری ببێ، بەمەیان دەگوت: (بەحیرە) ، (سائبە)یش: ئەوەبوو کەسێك ئەیوت: ئەگەر لەم نەخۆشییە چاك بوومەوە، مەرج بێت ئەو وشترەیەم (سائبە) بێ، واتە: بۆ خۆی بەرەڵڵا بێ و، نابێ هیچ سوودێکی لێ وەربگیردرێ، (وصیلە)ش: ئەو وشترەیە کە بە سکێك نێرەیەك و مێچکەیەکی دەبوو ، ئەوسا ئەیانوت: ئەوا لەبەر خاتری ئەم وشترە مێچکەیە نێرەکەش سەرنابڕین، ئیتر دەبوویە (وصیلە)و ئازاد دەبوو. (حام)یش ئەو وشترە نێرە بوو کە بەهۆی ئەوەوە وشترێکی مێینە دە سك بکات، ئیتر پێیان دەگوت: خۆی لەسەر بڕین ڕزگار کرد! ئینجا کاتێ کەئیسلام هات هەموو ئەمانەی ڕەت کردوەو، ڕێی بەوخەڵکە سەرلێشێواوەدا گۆشتیشیان بخۆن و سوودی تریشیان لێ وەرگرن، ﴿ولکن الذین کفروا﴾ خوا حەرامی نەکردبوون، بەڵکو کافرو بێ باوەڕەکان، خۆیان بۆخۆیان حەرامیان کردبوو ﴿یفترون علی الله الکذب﴾ هەمیشە لە سەر خوا درۆو پڕو پاڵانتە هەڵئەبەستن، واتە: هەرخۆیان حەڵاڵ حەرام ئەکەن و، حەرام حەڵاڵ ئەکەن! ﴿واکثرهم لا یعقلون﴾ زۆربەشیان نەزان و بێ ئەقڵ و بێ دەرکن، بۆیە ئەو بڕیارانە بۆخۆیان ئەدەن و، پێشی خوا

دەکەون ﴿[١٠٤] وإذا قیل لهم﴾ هەرکات پێیشیان بگوترێ: ﴿تعالوا إلى ما انزل الله وإلى الرسول﴾ گشت وەرن بۆلای ئەو کتێبەی خوا ناردوویەتی و، بێن بەرەو فەرمانی پەیامبەری ئەو ﷺ، هەتا ڕێتان بۆ ڕوون بێتەوە ﴿قالوا حسبنا ما وجدنا علیه آباءنا﴾ ئەڵێن: ئێمە هەر ئەو ئایینەمان بەسە کە لە باوباپیرانمانەوە دەسمان کەوتووە، وەهەر تەنها لەویش پەیڕەوی ئەکەین ﴿اولو کان آباؤهم لا یعلمون شیئا ولایهتدون﴾ کە باوو باپیرانیشیان هیچییان نەزانیوە وڕێیان دەرنەکردووە، ئاخۆ هەردوایان بکەون ؟ ﴿[١٠٥] یا ایها الذین آمنوا علیکم انفسکم﴾ ئەی گەلی خاوەن باوەڕ ! خەریکی پاکسازی دەروونی خۆتان بن و، خۆ بگونجێنن لەگەڵ خواداو هەمیشە هۆشتان بە خۆتانەوە بێ ﴿لا یضرکم من ضل إذا اهتدیتم﴾ ئەوساکە بڕواتان هێناو ڕێتان دۆزییەوەو ئامۆژگاری خەڵکیشتان کرد، ئیتر خەڵکانیگومڕا بوو ناتوانن زیانتان پێ بگەیەنن، هەرچەندە پیلان بگێڕن ﴿إلى الله مرجعکم جمیعا﴾ هەمووشتان هەربۆلای خوای گەورە دێنەوە ﴿فینبئکم بما کنتم تعملون﴾ ئینجا هەرچیتان کردووە ئاگادارتان دەکات لێی و، پاداشیشتان ئەداتەوە. پیاوێکی موسڵمانی هۆزی (بەنی سەهم) لەگەڵ دوو پیاوی گاوردا (تەمیم و عەدیی) چوونە سەفەرێك و لە ڕێگەدا (سەهم)ییەکە مردو هیچ موسڵمانێك لەو دەووربەرەدا نەبوو تا وەسیەتیان لابکات، جاکە دوو فەلەکە کەلەپوورەکەیان بردەوە بۆ مێراتبەرەکانی دەفرێکی زیوینیان لێگلدایەوە بۆ خۆیان، پەیامبەر ﷺ سوێندی دان کەهیچ شتێکیان لا نەدابێ، پاشان لە مەککەدا دەفرەکە بینرا دەفرۆشرا !! فرۆشیارەکان وتیان: ئێمە لە(تەمیم) و(عەدیی)مان کڕیوە، میراتبەرانی مردووەکەیش سوێندیان خوارد کە ئەو دەفرەزیوەماڵی فلانی خزمیانە، ئیتربۆ وەلامی ڕاستیی ئەم ئایەتە- وەك بوخاریی و ترمزیی هێناویانە-هات وفەرمووی: ﴿[١٠٦] یاایها الذین آمنوا شهادة بینکم﴾ ئەی وانەی باوەڕتان هێناوە! ﴿إذا حضر احدکم الموت﴾ هەرکات یەکێکتان مەرگی هات ﴿حین الوصیة اثنان﴾ ویستی وەسیەتێ بکا، دەبێ لەکاتی وەسیەتەکەدا دووکەسی ﴿ذوا عدل منکم﴾ دادگەر لەخۆتان بکاتە شایەد ﴿او آخران من غیرکم إن انتم ضربتم فی الأرض فاصابتکم مصیبة الموت﴾ خۆئەگەر چوونە سەفەر و مەرگتان ئەوقە بوو، موسڵمانیشتان دەست نەکەوت،دەتوانن دوو کەستر لە غەیری خۆتان بکەنە شایەد ﴿تحبسونهما من بعد الصلاة فیقسمان بالله إن ارتبتم﴾ جائەگەر لەو دوو شایەدە بەد گومان بوون، هەتا دوای نوێژی عەسرهەردوو ڕا گرن، ئەوسا دەبێ سوێندێ بخۆن ﴿لا نشتری به ثمنا﴾ کە: ئێمە لەبەرهیچ کەسێك دینمان بە هیچ شتێك نا فرۆشین ﴿ولو کان ذا قربی﴾ هەر چەندەئەو کەسەکە بە سوێندەکەی ئێمە شتێکی دەستکەوێ خزمیشمان بێت ﴿ولا نکتم شهادة الله﴾و شایەتی خوایش نەشارینەوە ﴿إنا إذا لمن الآثمین﴾ ئەگینە تاوانبارو گوناهبار دەبین ﴿[١٠٧] فإن عثر على انهما استحقا إثما﴾ ئینجا ئەگەر- دوای

الجزء السابع | سورة المائدة

وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْاْ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ قَالُواْ حَسْبُنَا مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَآ أَوَلَوْ كَانَ ءَابَآؤُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَهْتَدُونَ ﴿١٠٤﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهْتَدَيْتُمْ إِلَى ٱللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٠٥﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ شَهَٰدَةُ بَيْنِكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ حِينَ ٱلْوَصِيَّةِ ٱثْنَانِ ذَوَا عَدْلٍ مِّنكُمْ أَوْ ءَاخَرَانِ مِنْ غَيْرِكُمْ إِنْ أَنتُمْ ضَرَبْتُمْ فِى ٱلْأَرْضِ فَأَصَٰبَتْكُم مُّصِيبَةُ ٱلْمَوْتِ تَحْبِسُونَهُمَا مِنۢ بَعْدِ ٱلصَّلَوٰةِ فَيُقْسِمَانِ بِٱللَّهِ إِنِ ٱرْتَبْتُمْ لَا نَشْتَرِى بِهِۦ ثَمَنًا وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰ وَلَا نَكْتُمُ شَهَٰدَةَ ٱللَّهِ إِنَّآ إِذًا لَّمِنَ ٱلْءَاثِمِينَ ﴿١٠٦﴾ فَإِنْ عُثِرَ عَلَىٰٓ أَنَّهُمَا ٱسْتَحَقَّآ إِثْمًا فَـَٔاخَرَانِ يَقُومَانِ مَقَامَهُمَا مِنَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَحَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلْأَوْلَيَٰنِ فَيُقْسِمَانِ بِٱللَّهِ لَشَهَٰدَتُنَآ أَحَقُّ مِن شَهَٰدَتِهِمَا وَمَا ٱعْتَدَيْنَآ إِنَّآ إِذًا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠٧﴾ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن يَأْتُواْ بِٱلشَّهَٰدَةِ عَلَىٰ وَجْهِهَآ أَوْ يَخَافُوٓاْ أَن تُرَدَّ أَيْمَٰنٌۢ بَعْدَ أَيْمَٰنِهِمْ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱسْمَعُواْ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿١٠٨﴾

١٢٥

سوێند خواردنەکە-زانراو دەرکەوت کە دوو شایەتەکەی پێشوو درۆیان کردووە و خۆیان تاوانبار کردووە ﴿فآخران یقومان مقامهما من الذین استحق علیهم الأولیان﴾ دەبێ دوو کەسی شیاوو نزیکتر لە میراتبەرانی مردووەکە لە جیاتی ئەو دوو شایەدە پێشووە درۆزنە" گوناهبارە" بێنە پێش ﴿فیقسمان بالله لشهادتنا أحق من شهادتهما﴾ سوێندێ بخۆن وبڵێن : سوێندبەخوا ئەم شایەتیەی ئێمە لە شایەتیەکە ی ئەوان راستروهە قترە ﴿وما اعتدینا﴾ لە هەقیش لامان نەداوە ﴿إنا إذا لمن الظالمین﴾ دەنا لە ستەمکاران دەبین، ئینجا پاش سوێند خواردنەکە ماڵەکە دەدرێتەوە بە میراتبەرانی مردووەکە. ﴿١٠٨ ذلك ادنى أن یأتوا بالشهادة على وجهها﴾ ئەوەش باشتر و نزیکترە بەوەوە کە ئەو دوو شایەتە وەك خۆی شایەتییەکە بدەن و، گزی تیا نەکەن ﴿أو یخافوا أن ترد أیمان بعد أیمانهم﴾ وەیان بترسن کە بە سوێندی ئەوانی دیکە، سوێندەکانی ئەمان ڕەت بکرێنەوە ﴿واتقوا الله واسمعوا﴾ دەسا لە خوا بترسن و لە سوێندەکانتانا درۆوگزی مەکەن و، هەمیشە هەق بگرنە گوێ و، کاری پێبکەن ﴿والله لا یهدی القوم الفاسقین﴾ خوایکارجوانیش هەرگیز خەڵکانی لەسنوور دەرچوو، شارەزاورێنما ناکا بۆ ڕێی راست.

تێبینی: ئەگەر لەجێگایەکدا موسڵمان دەست نەکەوت بکرێ بەشایەت لەسەر هەر وەسیەتنامەیەك دەتوانرێ جوولەکە و گاور، یان ئاگرپەرست بکرێنە شایەت لەسەر وەسیەتەکە.

ڕێنماییەکانی ئایەتی (١٠٦-١٠٨):

١- وەسیەتکردن چ لەماڵەوە، چ لەسەفەردا سوننەتە.

٢- بە شایەد گرتنی موسڵمان لەسەر وەسیەتکردن واجیبە.

٣- ئەگەر موسڵمان دەست نەکەوت بۆ شایەدی، ئەوا ناموسڵمانیش دەبێ، بەومەرجە وەکو ئیمامی (ئەحمەد) ئەڵێ ئەم ئایەتە مەنسوخ نەبێ، دیارە قسەی ڕاستیش لەناو زاناکاندا هەر ئەمەیەکە (مەنسووخ) نیە.

٤- سوێندانی خەڵکی پاش نوێژی عەسر، لەبەر گرنگیدان بە سوێندەکە، وەکو لەفەرموودەدا هاتووە سوننەتە.

٥- ئەگەر (دادوەر) لەشایەدەکان دوودڵ بوو، دەتوانێ سوێندیان بدا.

## پێغەمبەران پرسیاری قەومەکەیانیان لێدەکرێت:

﴿١٠٩ یوم یجمع الله الرسل﴾ لەو ڕۆژە بترسن کە خوا گشت پەیامبەرەکانی خۆی کۆدەکاتەوە ﴿فیقول ماذا أجبتم﴾ ئەوجار لێیان ئەپرسیو ئەفەرموێ: ئەرێ چۆن وەڵامێکتان درایەوە لەلایەن ئەو گەلانەوە نێردران بۆلایان، کاتێ بانگتان دە کردن بۆ ڕێی ڕاست ؟﴿قالوا لا علم لنا﴾ جا لەبەر شەرم وئەدەبی خۆیان و، سەختی ڕۆژەکە ئەڵێن: خوایە ! ئێمە هیچ زانیارییەکمان لە وبارەیەوە نیە ﴿إنك انت علام الغیوب﴾ چونکە بێگومان تەنها هەر ئەتۆی کەبە تەواوی لەحاڵی گشت نادیارەکان بەئاگای.

## عیسا! ئەم چاکانەت لەبیر نەچێ:

﴿١١٠ إذ قال الله یاعیسى ابن مریم﴾ دەبێ ئەو بەخشش و بەهرانەتان لە بیربێ کەخوای لەکارزان بە عیسای کوڕی مەریەمیداو،پێی فەرموو:﴿اذكر نعمتی علیك وعلى والدتك﴾ عیسا! یادی بەخششەکانی من بکەوە کە بەخشیم بە خۆت و دایکت ﴿إذ أیدتك بروح القدس﴾ ئەودەمە کە بە جبریل پشتگیریم لێی کردیت و، بەمەریەمی دایکیشت مژدەدەماندا ﴿تكلم الناس فی المهد وكهلا﴾ کە لەبەر پاکانە بۆ دایکت و، دەرکەوتنی پلەوپایەی بەرزی خۆیشت، هەم بەمنداڵی و لەبێشکەدا، هەم بەگەورەیی ولە هەرەتی دەسەڵاتدا، دەتوانی لەگەڵ ئەو خەڵکانەدا وەڵامی ژیرانە بدەیتەوەو، قسەی پێغەمبەرانە بکەیت. ﴿وإذ علمتك الكتاب والحكمة والتوراة والإنجیل﴾ ئەمەیشت

لەبیر بێت عیسا! کەمن تۆم فێری نووسین و وردەکاریی و تەورات و ئینجیل کرد ﴿وإذ تخلق من الطين كهيئة الطير
بإذني﴾ وەئەمەش کاتێ بەفەرمان و یارمەتی من شێوەی پەلەوەرێکت لەقوڕ دەنەخشان وساز دەکرد ﴿فتنفخ
فيها﴾ ئینجا فووت پیادەکرد ﴿فتكون طيرا بإذني﴾ بە فەرمان و دەسەڵاتی من دەبوو بە باڵندەیەك و دەفڕی ﴿وتبرئ
الأكمه والأبرص بإذني﴾ دیسان وەهەر بە ئیزن وفەرمانی من کوێری زگماك و بەڵەکت چاك ئەکردەوە ﴿وإذ تخرج
الموتى بإذني﴾ هەربە کۆمەك و ئیزنی من بوو توانیت مردوو لەگۆڕ دەر بهێنێ‌و زیندووی بکەیتەوە ﴿وإذ كففت بني
إسرائيل عنك﴾ ئەو کاتەیشت لەبیربێت کە دەستی جوولەکەم لێ بەدوور گرتیت و نەمهێشت زیانت لێدەن ﴿إذ
جئتهم بالبينات﴾ ئەو دەمە کەتۆ ئەوهەموو نیشانە ڕوونانەت بۆ هێنان ﴿فقال الذين كفروا منهم﴾ جاکافرو بێ
باوەڕەکانیشیان وتیان: ﴿إن هذا إلا سحر مبين﴾ ئەمە ببێ و
نەبێ جادوویەکی‌ئاشکرایە ﴿[111] وإذ أوحيت إلى الحواريين﴾
ئەی عیسا! بیری ئەو بەخششەیش بکەوە کە دڵسۆزەکانتم
تێگەیاند ﴿أن آمنوا بي وبرسولي﴾ دەبێ بڕواتان بە من هەبێ
و بەپەیامبەرەکەشم, واتە: پشتیوانی لێ بکەن و باوەڕتان
پێی هەبێت ﴿قالوا آمنا واشهد بأننا مسلمون﴾ وتیان:
خوایە! باوەڕمان هێنا تۆشایەت بە ، کە ئێمە هەر موسڵمان
و گوێڕایەڵی تۆین ﴿[112] إذ قال الحواريون ياعيسى ابن
مريم﴾ بیربکەوە کە حەوارییە دڵسۆزە شوێنکەوتووەکانت
وتیان: ئەی عیسای کوڕی مەریەم! ﴿هل يستطيع ربك﴾
ئەرێ دەکرێ پەروەردگارت ﴿أن ينزل علينا مائدة من
السماء﴾ لەئاسمانەوە خوانێکمان بۆ بنێرێتە خوارەوەو
هەموو جۆرە خواردنێکی تێدابێت؟ ﴿قال اتقوا الله﴾ عیسا
وتی: خەڵکینە! لەخوا بترسن و واز لەوجۆرە قسانە بێنن
﴿إن كنتم مؤمنين﴾ ئەگەر ڕاستە باوەڕتان بە دەسەڵاتی خوا
هەیە ﴿[113] قالوا نريد ان نأكل منها﴾ گوتیان: ئاخر
ئەمانەوێ لێی بخۆین ﴿وتطمئن قلوبنا﴾ و دڵنیایش ببین
لەسەر یەکتاپەرستیی خواو، ڕاستیی تۆ ﴿ونعلم ان قد صدقتنا﴾ و باشتریش بزانین کە تۆ ڕاستت لەگەڵ کردوین
﴿ونكون عليها من الشاهدين﴾ و بشبینە شایەت کە ئەوخوانە بەڵگەی دەسەڵاتی خوایەو، باوەڕیشمان بتەوتر ببێ.

الجزء السابع | سورة المائدة

الحزب ١٣
۞ يَوْمَ يَجْمَعُ ٱللَّهُ ٱلرُّسُلَ فَيَقُولُ مَاذَآ أُجِبْتُمْ قَالُوا۟ لَا عِلْمَ
لَنَآ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴿١٠٩﴾ إِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ
ٱذْكُرْ نِعْمَتِى عَلَيْكَ وَعَلَىٰ وَٰلِدَتِكَ إِذْ أَيَّدتُّكَ بِرُوحِ
ٱلْقُدُسِ تُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِى ٱلْمَهْدِ وَكَهْلًا ۖ وَإِذْ عَلَّمْتُكَ
ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ ۖ وَإِذْ تَخْلُقُ
مِنَ ٱلطِّينِ كَهَيْـَٔةِ ٱلطَّيْرِ بِإِذْنِى فَتَنفُخُ فِيهَا فَتَكُونُ طَيْرًۢا
بِإِذْنِى ۖ وَتُبْرِئُ ٱلْأَكْمَهَ وَٱلْأَبْرَصَ بِإِذْنِى ۖ وَإِذْ تُخْرِجُ
ٱلْمَوْتَىٰ بِإِذْنِى ۖ وَإِذْ كَفَفْتُ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَنكَ إِذْ
جِئْتَهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْهُمْ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ
مُّبِينٌ ﴿١١٠﴾ وَإِذْ أَوْحَيْتُ إِلَى ٱلْحَوَارِيِّۦنَ أَنْ ءَامِنُوا۟ بِى
وَبِرَسُولِى قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا وَٱشْهَدْ بِأَنَّنَا مُسْلِمُونَ ﴿١١١﴾ إِذْ قَالَ
ٱلْحَوَارِيُّونَ يَٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ هَلْ يَسْتَطِيعُ رَبُّكَ أَن
يُنَزِّلَ عَلَيْنَا مَآئِدَةً مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ۖ قَالَ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ إِن كُنتُم
مُّؤْمِنِينَ ﴿١١٢﴾ قَالُوا۟ نُرِيدُ أَن نَّأْكُلَ مِنْهَا وَتَطْمَئِنَّ قُلُوبُنَا
وَنَعْلَمَ أَن قَدْ صَدَقْتَنَا وَنَكُونَ عَلَيْهَا مِنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿١١٣﴾

قال عيسى | ١٢٦

**هاتنی ( خوانە )کە بۆ قەومەکەی عیسا :**

﴿[114] قال عيسى ابن مريم﴾ عیسای کوڕەکەی مەریەم وتی:﴿اللهم ربنا انزل علينا مائدة من السماء﴾ ئەی خوای
پەروەردگارمان! بەمیهرەبانی خۆت لەو ئاسمانەوە خوانێکمان بۆ بنێرە خوارەوە ﴿تكون لنا عيدا لأولنا وآخرنا﴾ کە
بۆ ئەمانەمان ئێستا هەین و بۆ ئەوانەیش دوایی دێن، ببێتە جەژن و مایەی خۆشی، واتە: ئەو ڕۆژە بکەینە جەژن و
خۆشی بۆ گشت لامان ﴿وآية منك﴾ و نیشانەیەکیش بێ لەتۆوە بۆ ڕاستیی پەیامبەریەتی من ﴿وارزقنا وانت خير
الرازقين﴾ دەسا بژێویی و ڕۆزییەکی بێ ماندوو بوونمان بدەرێ، چونکە هەر ئەتۆی چاکترین ڕۆزیدەران ﴿[115] قال

**الله إنی منزلها علیکم﴾** خوا وەڵامی دانەوەو فەرمووی باشە ! وا من ئەو خوانەیەتان بۆ دەنێرم **﴿فمن یکفر بعد منکم﴾** ئینجا دوای ئەو خوانە ئیتر هەرکەسێکیتان بێ باوەڕ بێت بە پەیامبەرەکەم عیسا ﷺ **﴿فإنی أعذبه عذابا لا أعذبه احدا من العالمین﴾** ئەوا من سزایەکی توندی وای ئەدەم کە تائێستا لەناو خەڵکی جیهاندا سزای هیچ کەسێکم وا نەدابێ.

**سەرنجێك:** زاناکان بەکۆی دەنگ دەڵێن: خوای میهرەبان وەڵامی دانەوەوخوانەکەی بۆ ناردن.

**عیسا لەشیرك حاشا دەکا:**

﴿[١١٦] **وإذ قال الله یا عیسی ابن مریم﴾** ئەوکاتەش وەبیربێنە کە خوای کارزان لە ڕۆژی قیامەتدا بە عیسای کوڕی مەریەم دەڵێ: **﴿انت قلت للناس اتخذونی وامی إلهین من دون الله﴾** ئەرێ تۆ بەوخەڵکەت گوت کە لە جیاتی خوای تاك وتەنیا خۆت وادایکت بکەنە دوو خوا ؟! **﴿قال سبحانك ما یکون لی ان اقول مالیس لی بحق﴾** عیسایش دەڵێ: خوایە! من هەمیشە تۆبە پاك و خاوێن رائەگرم و،هەرگیزیش بۆمن ناشێ شتێکی ناراست و ناشیاوی وا بەرامبەر بە تۆبڵێم **﴿إن کنت قلته فقد علمته﴾** ئەگەر ئەو قسەیەم کردبێ، بێ شك تۆ خۆت دەزانی **﴿تعلم ما فی نفسی﴾** هەرچی لەناخی مندایە تۆ ئەیزانیت **﴿ولا اعلم ما فی نفسك﴾** بەڵام من دەربارەی ئەوەی لە نەفس وزاتی تۆدایە شتێکی ئەوتۆ نازانم **﴿إنك انت علام الغیوب﴾** بە ڕاستیی تەنها هەر خۆتی بەهەموو نادیارەکان زانایت ﴿[١١٧]
**ما قلت لهم الا ما امرتنی به﴾** چیت فەرمان پێکردوم ، منیش هەرئەوەم پێگوتوون **﴿ان اعبدوا الله ربی وربکم﴾** پێم وتون: کە تەنها هەر (الله) بپەرستن، کە پەروەردگاری من وئێوەیە **﴿وکنت علیهم شهیدا مادمت فیهم﴾** هەتا لە ناویشیاندا بوم ئاگاداریان بووم **﴿فلما توفیتنی کنت انت الرقیب علیهم﴾** کە مردیشم بەفەرمانی خۆت، ئیتر تۆ بۆخۆت چاودێرو ئاگاداریان بوویت **﴿وانت علی کل شئ شهید﴾** دیاریشە کە تۆ بوخۆت بەسەر هەمووشتێکا بە ئاگای ﴿[١١٨] **إن تعذبهم فإنهم عبادك﴾** ئێستایش ئەگەر تۆ سزایان بدەیت، بێگومانە کە بەندەی خۆتن و، کەسیش بۆی نییە هیچ بڵێت **﴿وان تغفر لهم فإنك انت العزیز الحکیم﴾** ئەگەر لێشیان ببوریت، ئەوەخۆت چاك دەزانی و، بۆخۆشت دەسەڵاتدارو کارجوانی.

**هەر ڕاستییە بەکەڵك دێ:**

﴿[١١٩] **قال الله هذا یوم ینفع الصادقین صدقهم﴾** خوای بە هەق پاش ئەوهەموو ئامۆژگارییە کردنی فەرمووی: ئیتر ئەمڕۆراستگۆیان ،راستگۆییان کەڵکیان پێدەگەیەنێت. واتە: تەنیا یەك خواپەرستان قازانجیانە **﴿لهم جنات تجری من تحتها الأنهار﴾** بۆخوا پەرستانی راستگۆ، لەبەهەشتدا چەند باخاتێك هەیە، وبەبەریاندا چەندین ڕووبار

سُورَةُ المَائِدَة　　الجُزءُ السَّابِع

قَالَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ ٱللَّهُمَّ رَبَّنَآ أَنزِلۡ عَلَيۡنَا مَآئِدَةٗ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ تَكُونُ لَنَا عِيدٗا لِّأَوَّلِنَا وَءَاخِرِنَا وَءَايَةٗ مِّنكَۖ وَٱرۡزُقۡنَا وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿١١٤﴾ قَالَ ٱللَّهُ إِنِّي مُنَزِّلُهَا عَلَيۡكُمۡۖ فَمَن يَكۡفُرۡ بَعۡدُ مِنكُمۡ فَإِنِّيٓ أُعَذِّبُهُۥ عَذَابٗا لَّآ أُعَذِّبُهُۥٓ أَحَدٗا مِّنَ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١١٥﴾ وَإِذۡ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ ءَأَنتَ قُلۡتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَٰهَيۡنِ مِن دُونِ ٱللَّهِۖ قَالَ سُبۡحَٰنَكَ مَا يَكُونُ لِيٓ أَنۡ أَقُولَ مَا لَيۡسَ لِي بِحَقٍّۚ إِن كُنتُ قُلۡتُهُۥ فَقَدۡ عَلِمۡتَهُۥۚ تَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِي وَلَآ أَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِكَۚ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلۡغُيُوبِ ﴿١١٦﴾ مَا قُلۡتُ لَهُمۡ إِلَّا مَآ أَمَرۡتَنِي بِهِۦٓ أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمۡۚ وَكُنتُ عَلَيۡهِمۡ شَهِيدٗا مَّا دُمۡتُ فِيهِمۡۖ فَلَمَّا تَوَفَّيۡتَنِي كُنتَ أَنتَ ٱلرَّقِيبَ عَلَيۡهِمۡۚ وَأَنتَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ ﴿١١٧﴾ إِن تُعَذِّبۡهُمۡ فَإِنَّهُمۡ عِبَادُكَۖ وَإِن تَغۡفِرۡ لَهُمۡ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿١١٨﴾ قَالَ ٱللَّهُ هَٰذَا يَوۡمُ يَنفَعُ ٱلصَّٰدِقِينَ صِدۡقُهُمۡۚ لَهُمۡ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿١١٩﴾ لِلَّهِ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا فِيهِنَّۚ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرُۢ ﴿١٢٠﴾

١٢٧

بەخوڕ دەچێت ﴿خالدين فيها أبدا﴾ بەهەتاهەتاییش تێیاندا ئەمێننەوە ﴿رضى الله عنهم﴾ خوای میهرەبان لێیان ڕازییە، واتە: کردەوەکانی وەرگرتوون ﴿ورضوا عنه﴾ و ئەوانیش لەخوا ڕازین ﴿ذلك الفوز العظيم﴾ هەرئەوەیش سەرکەوتن و سەرفرازی گەورەیە ﴿[120] لله ملك السموات والأرض وما فيهن﴾ ئاسمانەکان و زەویی و، هەرچیش لەنێوانیاندایە گشتی موڵکی خوایە، واتە: هەموو شتێك هەرئەو دروستی کردووە، بۆیە نە پێویستی بەژن هەیە نە بەمندالْ ﴿وهو على كل شئ قدير﴾ هەرئەویشە بەسەر هەمووشتێکیشدا بەتواناو بەدەسەڵاتە، ئەتوانێ هەموونیعمەتێ بە بەندەکانی ببەخشێت ، بۆیە ئێمەیش وەك (بەندە)یەکی خۆی هەمیشە داوای فەزڵ و بەخششی لێدەکەین.

سوپاسی فرەو زۆر بۆخوای خاوەن بەهرە، کە یارمەتیدام بۆ تەواوکردنی تەفسیری سوورەتی (مائیدە).

*** *** ***

## ٦- سوورەتی ( ئەنعام )ـە

## مەککەییەو ( ١٦٥ ) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتی (ئەنعام)ـەش یەکێکە لەسوورەتە درێژەکانی مەککە، جوغزو بازنەکەشی، هەرباسی عەقیدەو بناغەی ئیمان و باوەڕە، ئەڵبەتە جیاوازیی لەگەڵ سوورەتە مەدەنییەکاندا لە ئامانج و بۆچووندایە، چونکە سوورەتە مەککەییەکان وەکو سوورەتە مەدەنییەکان باسی ڕۆژوو و حەج و تۆڵە و یاسای خێزان و جەنگ و ئاشتیی ناکەن ، بەڵکو تەنیا لەبارەی ئەم شتە سەرەکییانەوە دەدوێن، وەکو: ١- خوایەتی خوای کارزان (الألوهية). ٢- وەحیی و پەیامی قورئان . ٣- زیندووبوونەوەو پاداش و تۆڵە، هەر لەبەرگرنگی ئەم سێ شتەیش بوو کە نزیکەی (١٣) ساڵ لەمەککەدا هەر لەو بارەوە قورئان دەهات. ئیمامی(تەبەریی) لە (عبدالله)ی کوڕی (عومەر)ـەوە لەبارەی فەزیلەتی ئەم سوورەتەوە دەگێڕێتەوە کەپێغەمبەرﷺ فەرمووی: (نزلت علىّ سورة الأنعام جملة واحدة، وشيّعها سبعون ألفا من الملائكة لهم زُجَلٌ بالتسبيح والتحميد). واتە: ئەم سوورەتی (ئەنعام)ـە گشت بە یەکجارو بەسەر یەکەوە بۆم هات و، حەفتا هەزار فریشتەیش لە تەشریفاتیا بوون و، بەدەنگی بەرز سوپاس و تەسبیحاتیان دەکرد. ﴿بسم الله الرحمن الرحيم * [1] الحمدلله الذى خلق السموات والأرض﴾ هەمووجۆرە سوپاس و ستایشێك تەنهاو تەنها بۆ ئەوخوایە کەئاسمانەکان و زەویی بەدیهێنا ﴿وجعل الظلمات والنور﴾ و تاریکاییەکان و ڕووناکیشی داهێنا، دیارە ڕێگاکانی گومرایی و، سەرلێشێواوی زۆرزۆرن، بۆیە قورئانی پیرۆز بەکۆ هێنایی و فەرمووی: ((وجعل الظلمات)). بەڵام چونکە ڕێگەو ڕێبازی بەختیاریی و سەرفرازیی تەنیا هەریەك ڕێگایە، کەدینی ئیسلامە بە(موفرەد)و تاك هێنایی و فەرمووی: (النور). ﴿ثم الذين كفروا بربهم يعدلون﴾ کەچی لەگەڵ ئەوەیشدا ئەوانەی کە کافرو بێ باوەڕن، دێن هاوبەش بۆ پەروەردگاریان دادەنێن و، بتان ئەکەنە هاوبەش بۆی!؟ کەبەڕاستیی ئەمەیشیان لە هەمووشتێ زیاتر جێگەی سەرسوڕمانە! ﴿[2] هوالذى خلقكم من طين﴾ هەر ئەو پەروەردگارە بوو کە (بابی) ئێوەی (ئادەم ﷺ) بۆ یەکەمجار لەقوڕ بەدیهێنا ﴿ثم قضى اجلا﴾ لەپاشان کاتێکی بۆ ژینیان دیاریکردو بڕیاریدا ﴿واجل مسمى عنده﴾ وادەیەکیشی بڕیاردا بۆ کۆتایی هەموو جیهان ﴿ثم انتم تمترون﴾ کەچی ئێوە دوای ئەو هەموو بەڵگانەیش لەسەر دەسەڵاتی خوا، هێمان هەر دوودڵ و بەگومانن لەزیندووبوونەوە! ﴿وهوالله فى السموات وفى الأرض﴾ لەئاسمانەکان

و لەزەوییدا خوا هەر ئەوخوایە کەناوی (الله)یە ﴿یعلم سركم وجهركم﴾ لەگشت کاری نهێنی و ئاشکراتان ئاگادارە ﴿ویعلم ماتکسبون﴾ خەریکی هەرکارێکیش بن چاك چاك پێیدەزانێ، جاکەوابوو هەر ئەوخوایە بپەرستن کە خاوەنی ئەو گشت سیفەتانەیە.

تێبینی: ئەم بێژەی (الله)یە لەم ئایەتەدا: (وهو الله في السموات...) بەسێ جۆر تەفسیر کراوە، یەکەم: بەمانای مەعبوودو پەرستراوە، واتە: هەرئەوە پەرستراوی ڕاستەقینەو بەهەق لەگشت ئاسمانەکان و زەوییدا، هەروەکو لەسوورەتی (٨٤/٤٣) یشدا دەفەرموێ: (وهو الذی فی السماء إله وفی الأرض إله) دووەم: فەرمایشتی: (یعلم سركم وجهركم) لە نێوان (وهوالله) و لەنێوان (فی السموات وفی الأرض) دایەو دەبێتە: (وهو الله یعلم سركم وجهركم فی السموات وفی الأرض) واتە: هەر ئەوە کە لەئاسمانەکان و زەوییدا بە گشت کارە نهێنی و ئاشکراکانتان دەزانێ، هەروەکو لەسوورەتی (٦/٢٥): (قل انزله الذی یعلم السر فی السموات والأرض ..) هاتووەو پشتگیری ئەو مانایە دەکا.

سێیەم: ئیمامی (تەبەریی) دەڵێ: دەبێ لەکاتی خوێندنەوەیدا لەسەر بێژەی (فی السموات)دا ڕابوەستیی و بڵێیت: (وهو الله فی السموات) ئەوسا (وفی الأرض)ی پەیوەست بکەیت بەپاشەکەیەوەو بڵێیت: (یعلم سركم وجهركم فی الأرض)، جا بەپێی ئەم مانای سێ یەمە دەبێتە: (الله ﷻ مستو على عرشه فوق جميع خلقه، مع انه یعلم سر أهل الأرض وجهرهم). ئایەتی (أأمنتم من فی السماء..)ی سوورەتی (ملك) و ئایەتی: (الرحمن على العرش استوى)ی سوورەتی (طه) پشتگیری لەومانایە دەکەن، (ئیبن کەسیر دەڵێ: دوای ئەمە زانایان یەکدەنگ وەستان دژی (جەهەنەمی)یەکان کە دەڵێن: خوا لەگشت جێگایەکدایەو بێ(مەکان)ـە. تەفسیری ئەو ئایەتەشیان بەهەر سێ شێوەکە کردۆتەوە.

الجزء السابع — سورة الأنعام

سُورَةُ الأَنۡعَامِ — ترتيبها ٦ — آياتها ١٦٥

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَجَعَلَ ٱلظُّلُمَٰتِ
وَٱلنُّورَۖ ثُمَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمۡ يَعۡدِلُونَ ١ هُوَ ٱلَّذِي
خَلَقَكُم مِّن طِينٖ ثُمَّ قَضَىٰٓ أَجَلٗاۖ وَأَجَلٞ مُّسَمًّى عِندَهُۥۖ ثُمَّ أَنتُمۡ
تَمۡتَرُونَ ٢ وَهُوَ ٱللَّهُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَفِي ٱلۡأَرۡضِۖ يَعۡلَمُ سِرَّكُمۡ
وَجَهۡرَكُمۡ وَيَعۡلَمُ مَا تَكۡسِبُونَ ٣ وَمَا تَأۡتِيهِم مِّنۡ ءَايَةٖ مِّنۡ
ءَايَٰتِ رَبِّهِمۡ إِلَّا كَانُواْ عَنۡهَا مُعۡرِضِينَ ٤ فَقَدۡ كَذَّبُواْ بِٱلۡحَقِّ
لَمَّا جَآءَهُمۡۖ فَسَوۡفَ يَأۡتِيهِمۡ أَنۢبَٰٓؤُاْ مَا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ٥ أَلَمۡ
يَرَوۡاْ كَمۡ أَهۡلَكۡنَا مِن قَبۡلِهِم مِّن قَرۡنٖ مَّكَّنَّٰهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مَا لَمۡ
نُمَكِّن لَّكُمۡ وَأَرۡسَلۡنَا ٱلسَّمَآءَ عَلَيۡهِم مِّدۡرَارٗا وَجَعَلۡنَا ٱلۡأَنۡهَٰرَ
تَجۡرِي مِن تَحۡتِهِمۡ فَأَهۡلَكۡنَٰهُم بِذُنُوبِهِمۡ وَأَنشَأۡنَا مِنۢ بَعۡدِهِمۡ قَرۡنًا
ءَاخَرِينَ ٦ وَلَوۡ نَزَّلۡنَا عَلَيۡكَ كِتَٰبٗا فِي قِرۡطَاسٖ فَلَمَسُوهُ بِأَيۡدِيهِمۡ
لَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ مُّبِينٞ ٧ وَقَالُواْ لَوۡلَآ أُنزِلَ
عَلَيۡهِ مَلَكٞۖ وَلَوۡ أَنزَلۡنَا مَلَكٗا لَّقُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ ثُمَّ لَا يُنظَرُونَ ٨

١٢٨ — ولو جعلناه

### موشریك زۆر نەهلی عینادە:

﴿٤ وما تأتیهم من آیة من آیات ربهم﴾ هەر بەڵگەو نیشانەیەك لە بەڵگەو نیشانەکانی خوای پەروەردگار بێتە لای هاوبەشدانەرەکان بۆ چەسپاندنی یەکتاپەرستیی و ڕاستیی پەیامبەر ﷺ ﴿إلا كانوا عنها معرضین﴾ ئەوەندە سەرسەختن ئیلالاو بیللا هەر ڕووی لێوەردەگێڕن و حاشای لێدەکەن ﴿٥ فقد كذبوا بالحق لما جاءهم﴾ ئەوەتە هەرکە ئەم قورئانەشیان بۆ هات، باوەڕیان پێ نەهێنا و بەدرۆیان دانا! ﴿فسوف یأتیهم انباء ما كانوا به یستهزءون﴾ دڵنیابن لە دوارۆژدا ئەنجامی بەدرۆخستنەوەی ئەوبەڵگانەیان پێدەگا کە ئەوان گاڵتەیان پێدەکرد و تۆڵەش وەردەگرن ﴿٦ الم یروا﴾ ئاخۆ ئەو بێ باوەڕانە نەیانبینیوەو عیبرەتیان وەرنەگرتووە ﴿كم اهلكنا من قبلهم من قرن﴾ کە خەڵکێکی زۆرمان لە پێش ئەوانەوە قڕکردو فەوتاند؟ ﴿مكناهم فی الأرض مالم نمكن لكم﴾ و دەسەڵات و توانایەکی وامان

پێدابوون کە بەئێوەمان نەدابوو ئەی قورەیش دەسا بۆکوێ چوون؟! ﴿وارسلنا السماء علیهم مدرارا﴾ وە لە ئاسمانیشەوە بارانێکی بەلێزمەو بە خوڕمان بۆ باراندن ﴿وجعلنا الأنهار تجری من تحتهم﴾ وامان کرد کەجۆگە و رووبارو کانیاوی زۆرو زەبەنە لە ژێر کۆشك و باخەکانیانەوە دەردەچوو ﴿فأهلكناهم بذنوبهم﴾ ئینجا بەهۆی تاوانەکانیانەوە قڕمانکردن و لەناومان بردن ﴿وانشانا من بعدهم قرنا آخرین﴾ وپاش لەناوبردنی ئەوانیش خەڵکێکی ترمان دامەزراندو بەدی هێنا، دیسان ئەوانیشمان بەهۆی لاساری خۆیانەوە لەناوبرد، دەسا ئێوەیش وریابن.

**ڕێنماییەکانی ئایەتی (٤-٦):**

١- پشت لەحەقکردن وکارپێنەکردنی، مانای باوەڕ نەبوونە پێی.

٢- مەسخەرەو گاڵتەکردن بە دین، دەبێتە هۆی هاتنی سزا.

٣- عیبرەت و پەند وەرگرتن لەمێژووی گەلانی رابووردوو تیاچوو.

٤- گشت ئۆممەتێك بە هۆی گوناحی خۆیەوە تیاچووە.

الجزء السابع — سورة الأنعام

وَلَوۡ جَعَلۡنَٰهُ مَلَكٗا لَّجَعَلۡنَٰهُ رَجُلٗا وَلَلَبَسۡنَا عَلَيۡهِم مَّا يَلۡبِسُونَ ٩ وَلَقَدِ ٱسۡتُهۡزِئَ بِرُسُلٖ مِّن قَبۡلِكَ فَحَاقَ بِٱلَّذِينَ سَخِرُواْ مِنۡهُم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ١٠ قُلۡ سِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ ثُمَّ ٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ١١ قُل لِّمَن مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ قُل لِّلَّهِۚ كَتَبَ عَلَىٰ نَفۡسِهِ ٱلرَّحۡمَةَۚ لَيَجۡمَعَنَّكُمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَا رَيۡبَ فِيهِۚ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ١٢ ۞ وَلَهُۥ مَا سَكَنَ فِي ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ١٣ قُلۡ أَغَيۡرَ ٱللَّهِ أَتَّخِذُ وَلِيّٗا فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَهُوَ يُطۡعِمُ وَلَا يُطۡعَمُۗ قُلۡ إِنِّيٓ أُمِرۡتُ أَنۡ أَكُونَ أَوَّلَ مَنۡ أَسۡلَمَۖ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ١٤ قُلۡ إِنِّيٓ أَخَافُ إِنۡ عَصَيۡتُ رَبِّي عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ ١٥ مَّن يُصۡرَفۡ عَنۡهُ يَوۡمَئِذٖ فَقَدۡ رَحِمَهُۥۚ وَذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡمُبِينُ ١٦ وَإِن يَمۡسَسۡكَ ٱللَّهُ بِضُرّٖ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَۖ وَإِن يَمۡسَسۡكَ بِخَيۡرٖ فَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ١٧ وَهُوَ ٱلۡقَاهِرُ فَوۡقَ عِبَادِهِۦۚ وَهُوَ ٱلۡحَكِيمُ ٱلۡخَبِيرُ ١٨

١٢٩

﴿[٧] ولو نزلنا علیك کتابا فی قرطاس﴾ ئەگەر لەباتی ئەم قورئانە کەئێستا بۆت هاتووە نووسراوەیەکی ترمان لەسەر کاغەزو لاپەڕەیەك دابەزاندبا ﴿فلمسوه بایدیهم﴾ جا دەستیان لێداباو بینابایان بۆ نەمانی گومان و دوو دڵییان ﴿لقال الذین کفروا﴾ هێشتای کافرو بێ باوەڕەکان، ئەوەندە نالەبارو ئەهلی عینادن هەر ئەیانوت: ﴿إن هذا إلا سحر مبین﴾ بێ و نەبێ ئەمە هەر جادوویەکی ئاشکراو نمایانەو، ئێمەی پێ چاوبەست کراوە!

**بەلای موشریکانەوە پێغەمبەر نابێ مرۆ بێ:**

﴿[٨] وقالوا لولا انزل علیه ملك﴾ دەشیانگوت: ئەرێ بۆخوا لەئاسمانەوە فریشتەیەکی بۆ نەناردە خوارەوە و، شایەتی پێغەمبەرێتی بۆ بدات, ئەگەر راست دەکات دەڵێ پەیامبەرم ﴿ولو انزلنا ملکا لقضی الأمر﴾ دیارە ئەگەر ئێمە فریشتەمان بۆئەوکارە ناردباو، ئەوانیش وەکو باوی خۆیان باوەڕیان نەهێنابا، بێگومان کار لەکار دەترازاو سزایان بۆ دەهات ﴿ثم لا ینظرون﴾ پاشانیش مۆڵەت نەئەدران تەنها چاو تروکانێکیش بژیین ﴿[٩] ولو جعلناه ملکا﴾ گریمان ئەگەر وەك خۆیان پێشنیاریان کرد گێڕابامان بەفریشتەیەك لەباتی ئەوە کەپەیامبەر مرۆڤە ﴿لجعلناه رجلا﴾ هەر دەبوو لەشکڵ و سیمای پیاوێکمان دانابا، چونکە ئەگەر لە بیچمی فریشتەدا بێتەلایان، هەرگیز قەبووڵی ناکەن ﴿وللبسنا علیهم ما یلبسون﴾ و ئەوساش ئەوەی وائێستا لێیان تێکەل بووەو دەڵێن پێغەمبەر نابێ فریشتەبێت، هەر هەمان رەخنە دەگرنەوەو لێیان تێك دەچێت، کەوابوو پێغەمبەر هەردەبێ بەشەربێت ﴿[١٠] ولقد استهزئ برسل

من قبلك﴾ بێگومانبە بەگەلێك لەپێغەمبەرانی بەرلەتۆش مەسخەرەو گاڵتەكراو نەشپسان، كەوابوو تۆش وەك ئەوان بە ئارام بەو ددان بەخۆتا بگرە ﴿فحاق بالذين سخروا منهم ما كانوا به يستهزءون﴾ ئەوسا لەئەنجامی ئەوگاڵتە پێكردنەدا سزاو جەزرەبە یەخەی گرتن ﴿[11] قل سيروا في الأرض﴾ پێیان بڵێ: بچن بە وڵاتی بێ باوەڕەكاندا ئەوانەی یاخیبوون گەشتێ بكەن ﴿ثم انظروا كيف كان عاقبة المكذبين﴾ ئەوسا تەماشاكەن، بزانن پاشەڕۆژی ئەوانە چۆن بوو كە، ئایەتەكانی خوایان بەدرۆ دادەنا؟

رێنمایەكانی ئایەتی (٧-١١):

١- هەڵگرانی پەیامی خوا تەنیا هەر مرۆڤ بوون، نەك فریشتە.

٢- گاڵتەو سووكایەتی كردن بەپێغەمبەران و بانگبەرانی دینی خوا، داب ونەریتی مرۆڤە لاسارەكانەو نەگۆڕاوەو، هەربووەو، هەردەیشبێ، بۆیە دەبێ گشتمان زۆر بەتابشت و خۆڕاگر بین.

٣- ئەنجامی بەدرۆ خەرەوان هەر تیاچوونە.

**دەبێ گش ملكەچی فەرمانی خوابین:**

﴿[12] قل لمن مافي السموات والأرض﴾ بڵێ ئەی پێغەمبەر!ﷺ ئەوی لە ئاسمانەكان و زەویدایە، موڵكی كێیە؟! ﴿قل لله﴾ تۆ بۆخۆت بڵێ: هەموو هەرموڵكی خوایە، نەك هی بتەكان ﴿كتب على نفسه الرحمة﴾ لەسەرخۆی نووسیوە كە دەبێ بە رەحمەت و میهرەبان بێت بەرامبەر بە بەندەكانی خۆی ﴿ليجمعنكم إلى يوم القيامة لاريب فيه﴾ دڵنیابن لەرۆژی قیامەتدا كە هاتنی بێگومانە هەمووتان بۆی كۆ دەكاتەوە، جا ئەوكاتە پاداشت و تۆڵە وەردەگرنەوە ﴿الذين خسروا انفسهم فهم لا يؤمنون﴾ ئەو كەسانەش كە زیانیان بە خۆیانگەیاندو، خۆیان دۆڕاند, باوەڕ ناهێنن و ددان بە یەكتاپەرستیدا نانێن ﴿[13] وله ماسكن في الليل والنهار﴾ هەرچی لە شەوو رۆژدا ئارام دەگرێت، گشت موڵكی ئەوەو، لەژێر دەسەلاتی ئەودایە ﴿وهو السميع العليم﴾ هەرخۆیشی هەمیشە بیسەرو زانایە ﴿[14] قل اغير الله اتخذ وليا﴾ بڵێ: دەتانەوێ منیش وەكوخۆتان لەخوا بەولاوە، كەسێكی تر بەدۆست و یارمەتیدەری خۆم بزانم؟! ﴿فاطر السموات والأرض﴾ كەبەدیهێنەری ئاسمانەكان و زەوییە﴿وهو يطعم ولا يطعم﴾ رۆزیش بەگشت دروست كراوەكان دەداو، خۆیشی لە رۆزی بێ نیازە؟ ﴿قل إني أمرت أن أكون اول من اسلم﴾ پێان بڵێ: فەرمانم پێدراوە كەیەكەمین موسڵمان و، یەكەمین كەس بم خۆ تەسلیم بەخوای گەورەم بكەم ﴿ولا تكونن من المشركين﴾ وەفەرمانم پێدراوە نابێ لە هاوبەشدانەران بیت ﴿[15] قل إني اخاف إن عصيت ربي عذاب يوم عظيم﴾ بڵێ: ئەگەر منیش وەكو ئێوە سەرپێچی لەخوای پەروەردگارم بكەم وبتان بپەرستم، دڵنیابن ئەوكارە بەمن ناكرێ، چونكە من لەئازاری رۆژێكی مەترسیدار دەترسم ﴿[16] من يصرف عنه يومئذ﴾ ئەوی لەو رۆژەدا رووی لەو سزایە وەرگێردرێ ﴿فقد رحمه﴾ ئەوە بەراستی خوا میهرەبانی لەگەڵ كردووەوبەر بەزەیی خۆی خستووە ﴿وذلك الفوز المبين﴾ دیارە هەرئەوەیش بەئاشكرا بەختیاریی و سەرفرازییە.

**چاكەو بەلا هەر بەدەستی خوایە:**

﴿[17] وإن يمسسك الله بضر﴾ ئەوخوایە دەسەلاتدارێكی وەهایە ئەگەر تووشی هەرجۆرە بەڵاو زیانێكت بكات ﴿فلا كاشف له إلا هو﴾ بەغەیرەز خۆی هیچ كەسێ ناتوانێ لای ببا ﴿وإن يمسسك بخير فهو على كل شئ قدير﴾ خۆئەگەر خێروچاكەیەكیشت پێبگەیەنێت ، دیارە هەرخۆی بەسەر هەمووشتیكا دەسەلاتدارەو حەزلە هەرچی بكا دەتوانێ ئەنجامی بدا، وەك ئەم فەرموودە سەحیحەش كەئیمامی تیرمیزی دەیهێنی دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بە (ئیبن

عەباس)ی فەرموو: ((یا غلام! أذا سألت فاسأل الله وإذا استعنت فاستعن بالله، واعلم أن الأمة لوا اجتمعوا على أن ينفعوك بشيء لم ينفعوك إلا بشيء قد كتب الله لك، ولو اجتمعوا على أن يضروك بشيء لم يضروك إلا بشيء قد كتب الله عليك، رفعت الأقلام وجفت الصحف)). واتە: ئەی لاوەکە! هەرکە ویستت داوا بکەیت، هەر لەخوای بکە، ویستیشت داوای هاوکاریی و کۆمەك بکەیت، دەبێ هەر لەخوای بکەیت، چاکیش بزانە کە ئەگەر هەموو خەڵکان کۆ ببنەوەو بیانەوێ قازانجێکت پێبگەیەنن، بەدەر لەوە کەخوا خۆی بریاری دابێت، ناتوانن هیچ قازانجێکت پێبگەیەنن، ئەگەریش کۆ ببنەوەو بیانەوێ زیانێکت پێبگەیەنن، ناتوانن، مەگەر ویستی خوای لەسەربێت، چونکە قەڵەمەکان (لەئەزەلدا) هەرچییان نووسی، نووسییان و، مەرەکەبەکەش وشکەوە بووە ﴿[18] وهو القاهر فوق عباده﴾ هەر خۆشیەتی زاڵ و دەست رۆیشت و بەسەرهەموو عەبدەکانیدا ﴿وهو الحكيم الخبير﴾ هەرئەویشە لەکارزان و کارجوان و بەئاگایەبە کاروباری بەندەکانی. قورتوبیی دەڵێ: موشریکەکان وتیان بە پێغەمبەرﷺ: کێ هەیە شایەدی لەسەر پێغەمبەرێتی تۆ بدا؟ جابۆ ئەو وەڵامە ئەم ئایەتە هات وفەرمووی: ﴿[19] قل اى شئ اكبر شهادة﴾ پێیان بڵێ: شایەتی کێ لەهەموو شایەتیەك مەزنترو گرنگترە بۆ راستیی پەیامبەرێتی من ؟ ﴿قل الله شهيد بيني وبينكم﴾ بڵێ: خوا کە لەهەموو شایەتێك گەورەترو بەئاگاترە لە نێوانماندا شایەتە بۆ راستیی من ﴿وأوحي إلي هذا القرآن لأنذركم به ومن بلغ﴾ بۆیە ئەم قورئانەشم وەحی بۆکراوە، کە ئێوەو هەرکەسێکیتریش دەنگی ئەم قورئانەی دەگاتێ، پێ بترسێنم و، ئاگادار کەمەوە ﴿إنكم لتشهدون ان مع الله الهة اخرى﴾ چلۆن ئێوە ئەی کافرو بێ باوەڕان! شایەتی ئەدەن کە لەگەڵ (الله)دا چەند خوایەکی تر هەبێ؟ ﴿قل لاشهد﴾ پێیان بڵێ: ئەگەر ئێوە شایەتی وابدەن ، دڵنیابن کەهەرگیز من شایەتی نادەم (الله) هاوبەشی ببێ، بەڵکو

الجزء السابع — سورة الأنعام

قُلْ أَيُّ شَيْءٍ أَكْبَرُ شَهَٰدَةً قُلِ ٱللَّهُ شَهِيدٌۢ بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ وَأُوحِىَ إِلَىَّ هَٰذَا
ٱلْقُرْءَانُ لِأُنذِرَكُم بِهِۦ وَمَنۢ بَلَغَ أَئِنَّكُمْ لَتَشْهَدُونَ أَنَّ مَعَ ٱللَّهِ
ءَالِهَةً أُخْرَىٰ قُل لَّآ أَشْهَدُ قُلْ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ وَإِنَّنِى بَرِىٓءٌ مِّمَّا
تُشْرِكُونَ ﴿١٩﴾ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَعْرِفُونَهُۥ كَمَا يَعْرِفُونَ
أَبْنَآءَهُمُ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٢٠﴾ وَمَنْ أَظْلَمُ
مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِهِۦٓ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ
﴿٢١﴾ وَيَوْمَ نَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ثُمَّ نَقُولُ لِلَّذِينَ أَشْرَكُوٓا۟ أَيْنَ شُرَكَآؤُكُمُ
ٱلَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴿٢٢﴾ ثُمَّ لَمْ تَكُن فِتْنَتُهُمْ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ وَٱللَّهِ
رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ ﴿٢٣﴾ ٱنظُرْ كَيْفَ كَذَبُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَضَلَّ
عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴿٢٤﴾ وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُ إِلَيْكَ وَجَعَلْنَا عَلَىٰ
قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ وَفِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرًا وَإِن يَرَوْا۟ كُلَّ ءَايَةٍ
لَّا يُؤْمِنُوا۟ بِهَا حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوكَ يُجَٰدِلُونَكَ يَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِنْ هَٰذَآ
إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٢٥﴾ وَهُمْ يَنْهَوْنَ عَنْهُ وَيَنْـَٔوْنَ عَنْهُ وَإِن
يُهْلِكُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴿٢٦﴾ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ وُقِفُوا۟ عَلَى ٱلنَّارِ
فَقَالُوا۟ يَٰلَيْتَنَا نُرَدُّ وَلَا نُكَذِّبَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا وَنَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢٧﴾

بل بدا لهم — ١٣٠

بەهەموو توانام نکوولی ئەوە دەکەم، چونکە هەرگیز ژێری رێگە نادا بەشتی وا ﴿قل إنما هو إله واحد﴾ بڵێ: ئەوخوایە, هەرتاك وتەنیایەو، کەسیتر شایەنی پەرستن نیە ﴿وانني برئ مما تشركون﴾ و لەشەریك دانانی ئێوە بۆ خوا، بەراستی من بەریی وبیزارم.

رێنماییەکانی ئایەتی (١٧-١٩):

١- بۆ هەمووشتێك دەبێ پەنا هەربە بەخوا ببرێ، وەك لەسوورەتی (یونس) وچەندین سوورەتی تردا دووپاتی ئەوە دەکاتەوەو دەفەرموێ: (ولا تدع من دون الله ما لا ينفعك ولا يضرك...) ١٠٦ .

٢- خوا شایەدی بۆ راستیی پێغەمبەر ئەدا بە ناردنی قورئان و نیشانە گەلێ بۆی.

٣- هەرکەس ئەم قورئانەی پێگەیشت , دەبێ وشیارەوبێ و بڕوبیانووی نەماوە.

٤- بنـەمای ئیسـلام لەسـەر وشـەی پـیرۆزی (لا إلـه إلا الله) دادەمـەزرێ، هـەروەك بیزاریـی و حاشایشـە لەهەمووجۆرە (شیرك)ێك. ﴿[٢٠] الذین آتیناهم الكتاب﴾ ئەو جولەكەو گاورانەی كتێب و نامەمان پێدابوون ﴿یعرفونه كما یعرفون أبناءهم﴾ هەروەكو كوڕەكانی خۆیان دەناسن، هەرئاوایش (پەیامبەر ﷺ) دەناسن، چونكە لەتەورات و ئینجیلدا سیفەتە بەرزوجوانەكانی هـاتووەو بەئاگایشـن لێیـان ﴿الـذین خسـروا انفسـهم﴾ ئـەو كەسـانەی زیانیـان لەخۆیاندا بە هەڵبژاردنی ڕێگا چەوتەكان ﴿فهم لا یؤمنون﴾ ئیتر باوەڕ ناهێنن بە موحەممەدﷺ چونكە هەرخەریكی ململانێ و عینادی خۆیانن ﴿[٢١] ومن أظلم ممن افترى على الله كذبا﴾ دەبێ كێ لەوكەسە ستەمكارتر بێ كە درۆ بەدەم خواوە هەڵبەسێت وبڵێ: لەقیامەتدا بتەكان شەفاعەتمان بۆدەكەن؟ ﴿اوكذب بآیاته﴾ وە یان بەئایەتەكانی خوا باوەڕ نەكاو، بەدرۆیان دانێت؟ ﴿إنه لا یفلح الظالمون﴾ بەڕاستیی ستەمكاران و درۆ هەڵبەستان قەت سەرفرازو ڕزگار نابن.

### لەشیركی موشریكان دەپێچینەوە:

﴿[٢٢] ویوم نحشرهم جمیعا﴾ ئەوڕۆژە وەبیر بێنە كە هەمووموشریكەكان -پاش زیندووكردنەوە- كۆ ئەكەینەوە بۆ لێپرسینەوە لەكاروكردەوەیان ﴿ثم نقول للذین اشركوا﴾ پاشان بەو كەسانە هاوەڵیان بۆ خوا دانا دەڵێین: ﴿این شركاؤكم الذین كنتم تزعمون﴾ لە كوێن ئەوانە ئێوە بە گومان كردبووتانن بەهاوەڵی خوا و، پێتان وابوو شەریكی خوان؟! دەسا ئێستا بیانهێنن ﴿[٢٣] ثم لم تكن فتنتهم﴾ لەپاشان لەوەڵامدا هیچ عوزرو بیانوو و وەڵامێكیان نیە ﴿إلا أن قالوا والله ربنا ما كنا مشركین﴾ ئەمە نەبێ كەبەڕاشكاوی ئەم درۆیە بكەن و بڵێن: سوێند بەخوای پەروەردگارمان هەرگیز ئێمە هاوبەشمان بۆ خوا دانەناوە ﴿[٢٤] انظر كیف كذبوا على انفسهم﴾ دە تەماشاكە تەنانەتی چۆن لەگەڵ خۆشیاندا درۆ دەكەن، هەروەك لەدونیادا درۆیان دەكردو ئەیان وت: (ما نعبدهم إلا لیقربونا..) ﴿وضل عنهم ما كانوا یفترون﴾ ئەو درۆودەلەسەیش هەڵیان بەستبوو لەسەر خوا لەكیسیان چوو و سوودیان لێنەبینی ﴿[٢٥] ومنهم من یستمع إلیك﴾ هەركە تۆ قورئان ئەخوێنیتەوە هەیانە دێت گوێت بۆ ڕائەگرێ و، هیچ كەڵكیشی لێوەرناگرێ ﴿وجعلنا على قلوبهم اكنة﴾ لەبەر كوفرەكەیان پەردەمان بەسەر دڵیاندا كێشاوە ﴿ان یفقهوه﴾ بۆئەوە لێت تێنەگەن ﴿وفي آذانهم وقرا﴾ لەبەر لاریی و لاسارییان گوێیانیشمان گران وقورسكردووەو ناهێڵین هیچ خێرێ ببیسن ﴿وإن یروا كل آیة لا یؤمنوا بها﴾ ئەوەند سەر سەختن كە ئەگەر هەرچی بەڵگەو نیشانەیش هەیە بەچاو ببینن، هێمان هەر باوەڕناكەن وددانناێن پێیدا، ئەی لەسەر داوای ئەوان مانگت بۆ لەت نەكردن، كەچی باوەڕیان نەهێناو وتیان ئەو كارە جادووە! ﴿حتى إذا جاؤك﴾ ئەوساكەیش كەهاتنە لات ﴿یجادلونك﴾دەكەونە شەڕە قسەوچەلەحانێ لەگەڵت ﴿یقول الذین كفروا﴾ كافرو بێ باوەڕەكان دەڵێن: ﴿إن هذا إلا أساطیر الأولین﴾ ببێ ونەبێ ئەم قورئانە هەر ئەفسانەو (ئوستورە)ـی پێشووەكانە، لەوە بەولاوە شتێكی دی نیە ﴿[٢٦] وهم ینهون عنه وینأون عنه﴾ هەم ڕێ لەخەڵكی دەگرن لەبیستنی قورئان و، هەم بۆخۆیشیان خۆیانی لێدوور دەگرن ﴿وإن یهلكون إلا انفسهم وما یشعرون﴾ بەم كارەشیان هەر خۆیان لەناو دەبەن و بەخۆش نازانن.

### پاش دیتنی سزا ، خوزگە هیچ نابەخشێ:

﴿[٢٧] ولو ترى إذ وقفوا على النار﴾ ئەر ئەوكاتە هاوبەشدانەرەكان ببینی كە لە بەرامبەر ئاگردا ڕاگیراوو بەند كراون، بێگومان كارێكی زۆر سامناك و گەورە دەبینی ﴿فقالوا یا لیتنا نرد﴾ ئینجا لەوڕۆژەدا دەڵێن: ئای خۆزگە جارێ تر دەگێڕراینەوە بۆ دونیا ﴿ولا نكذب بآیات ربنا﴾ و بە بەڵگەو نیشانەكانی پەوەردگارمان كافرو بێ باوەڕ

نـەدەبووین ﴿ونكون من المؤمنين﴾ ولـە بـڕواداران دەبووین ﴿[٢٨] بل بدا لهم ما كانوا يخفون من قبل﴾ دیـارە ئـەو خۆزگـەو پەشیمانییەیان ڕاسـت نییـە، بـەڵكو كـار لـەكار ترازاو،ئـەو كـارە خراپانـەشیان كـاتی خـۆی لـە خـەڵكیان ئەشاردەوە، ئێستا كەوتنـە ڕوو و بۆیـان دەركـەوتن و، بۆخۆشیان حاڵی بـوون ﴿ولو ردوا لعادوا لما نهوا عنه﴾ و ئەگەر گریمان بشگێڕرێنەوە بـۆ دونیا، ئـەو كارانـە ڕێیان لێدەگیرا ، هەمیسان دەچوونـەوە سەریان و هەردەیانكـەن ﴿وإنهم لكاذبون﴾ بـە ڕاستی درۆ ئەكـەن و لـە درۆزنـانن ﴿[٢٩] وقالوا إن هي إلا حياتنا الدنيا﴾ هـەتا لـە دنیاشدابوون دەیانگوت: بێجگە لەم ژیانەی دونیایەمان هیچ ژیانێ ترنی یە ﴿وما نحن بمبعوثين﴾وقـەتیش زینـدوو ناكرێینـەوە، واتـە: نـە ژیـانی ترهـەیـەو، نـە زینـدوو بوونـەوەش ﴿[٣٠] ولو ترى إذ وقفوا على ربهم﴾ وئەگەرئـەوكاتـە كـە لـە پـێش پەروەردگاریاندا ڕادەگیردرێن بۆ لێكۆڵینەوە بیانبینی!!﴿قال اليس هذا بالحق﴾ خـوا پێیـان ئەفـەرموێ: دە ئـاخۆ ئـەم زیندوو بوونەوەیە ڕاست و ڕەوان نەبوو؟ ﴿قالوا بلى وربنا﴾ ئەوانیش ئەڵێن: بـەڵێ سوێند بـە پـەروەردگارمان" ڕاسـت و ڕەوان بـوو ﴿قال فذوقوا العذاب بما كنتم تكفرون﴾ پێیـان دەفەرموێ: دەسا بە هـۆی ئـەوەی لـەدنیادا كـافرو بـێ بـاوەڕ بوون، ئێستا فەرموون سزاو جەزرەبـەی ئـەوە بچێژن ﴿[٣١] قد خسر الذين كذبوا بلقاء الله﴾ بەڕاستیی ئـەو كەسـانـەی دیـداری خوایـان بـەدرۆ دەزانیـی و، بـاوەڕیـان نـەدەكرد بـە زیندووبوونەوە، بێ سۆ بە تەواوی زیانمەند بوون ﴿حتى إذا جاءتهم الساعة بغتة﴾ تـا لـە ناكـاو قیامـەت و زینـدوو بوونـەوەیان لـێ پێشـدێ و، ئـەوانیش هـەر خـەریكی دوژمنایەتی و، ململانێن لەگەڵ قورئاندا ﴿قالوا يا حسرتنا على ما فرطنا فيها﴾ كاتێ قیامەتیان هات ئەڵێن: ئەی ئاخ و داغ! بۆ ئەوەندە ئێمە سستیی و، درێغیمان كرد لە دونیادا لەئەنجامدانی كـاری چاكەدا ﴿وهم يحملون أوزارهم على ظهورهم﴾ وئـەوانیش بـاری قورسـی گونـاهی خۆیانیـان بەكۆڵەوەیە ﴿الا ساء مايزرون﴾ بزانن! كە باروكۆڵەكەیان زۆر خراپ و ناڵەبارە ﴿[٣٢] وما الحياة الدنيا إلا لعب ولهو﴾ بە ئاگابن! كە زۆربەی ژیانی ئەم دونیایە هەر گاڵتەو گەپە ﴿وللدار الآخرة خير للذين يتقون﴾ دڵنیابن ئەو ماڵەكەی تـر -بەهەشـت- بـۆ ئەوانـەی كـە پارێزگـاری لەفەرمانـەكانی خـوا ئەكـەن چاكترە ﴿افلا تعقلون﴾ دەسـا ئـێتر بیرناكەنەوەو، ژیر نابن كەپاداشتی قیامەتتان بۆ چاكترە؟

### دڵدانەوەی پێغەمبەر:

﴿[٣٣] قد نعلم إنه ليحزنك الذي يقولون﴾ چاك ئەزانین بەوقسانەی كە كافروبێ باوەڕەكان بەرامبەر بە تۆ دەیكەن و دەڵێن، گوایە بەقسەی ئەوان تۆ شاعیرو شێتبی! ئەوساش بەو وشە ناپەسەندەیان دڵ زویر ئەبیت ﴿فإنهم لا يكذبونك﴾ لەڕاستیشدا لەسەر بنەمایەك بەدرۆزنت نازانن، بەڵكو چاك ئەزانن تۆ ڕاستگۆیت ﴿ولكن الظالمين بآيات



بَلْ بَدَا لَهُم مَّا كَانُوا يُخْفُونَ مِن قَبْلُ وَلَوْ رُدُّوا لَعَادُوا لِمَا نُهُوا عَنْهُ
وَإِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ ﴿٢٨﴾ وَقَالُوا إِنْ هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا وَمَا نَحْنُ
بِمَبْعُوثِينَ ﴿٢٩﴾ وَلَوْ تَرَىٰ إِذْ وُقِفُوا عَلَىٰ رَبِّهِمْ قَالَ أَلَيْسَ هَٰذَا
بِالْحَقِّ قَالُوا بَلَىٰ وَرَبِّنَا قَالَ فَذُوقُوا الْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ
﴿٣٠﴾ قَدْ خَسِرَ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِلِقَاءِ اللَّهِ حَتَّىٰ إِذَا جَاءَتْهُمُ السَّاعَةُ
بَغْتَةً قَالُوا يَا حَسْرَتَنَا عَلَىٰ مَا فَرَّطْنَا فِيهَا وَهُمْ يَحْمِلُونَ أَوْزَارَهُمْ
عَلَىٰ ظُهُورِهِمْ أَلَا سَاءَ مَا يَزِرُونَ ﴿٣١﴾ وَمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلَّا
لَعِبٌ وَلَهْوٌ وَلَلدَّارُ الْآخِرَةُ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَ أَفَلَا تَعْقِلُونَ
﴿٣٢﴾ قَدْ نَعْلَمُ إِنَّهُ لَيَحْزُنُكَ الَّذِي يَقُولُونَ فَإِنَّهُمْ لَا يُكَذِّبُونَكَ
وَلَٰكِنَّ الظَّالِمِينَ بِآيَاتِ اللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴿٣٣﴾ وَلَقَدْ كُذِّبَتْ
رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ فَصَبَرُوا عَلَىٰ مَا كُذِّبُوا وَأُوذُوا حَتَّىٰ أَتَاهُمْ نَصْرُنَا
وَلَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِ اللَّهِ وَلَقَدْ جَاءَكَ مِن نَّبَإِ الْمُرْسَلِينَ
﴿٣٤﴾ وَإِن كَانَ كَبُرَ عَلَيْكَ إِعْرَاضُهُمْ فَإِنِ اسْتَطَعْتَ أَن تَبْتَغِيَ
نَفَقًا فِي الْأَرْضِ أَوْ سُلَّمًا فِي السَّمَاءِ فَتَأْتِيَهُم بِآيَةٍ وَلَوْ شَاءَ
اللَّهُ لَجَمَعَهُمْ عَلَى الْهُدَىٰ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ الْجَاهِلِينَ ﴿٣٥﴾

الله يجحدون﴾ بەڵکو لەبەر ئەمەیە کە ستەمکارو بێ باوەڕەکان کردوویانە بەپیشە کە هەردەم نکوڵی و ململانێی ئایەتەکانی خوا بکەن ﴿[٣٤] ولقد كذبت رسل من قبلك فصبروا على ما كذبوا و أوذوا﴾ فرەیەك لەپەیامبەرانی بەر لەتۆ سوێند بە خوا لەلایەن گەلەکەیانەوە بە درۆ خرانەوەو، ئازارو ئەشکەنجە دران و، باوەڕیان پێنەکردن و، ددانیشیان بەخۆدا گرت ﴿حتى أتاهم نصرنا﴾ هەتا یارمەتی ئێمەیان پێگەیی، دەسا تۆش وابە. ﴿ولا مبدل لكلمات الله﴾ خۆ هیچ کەسێکیش نیە بتوانێ بڕیار و بەڵێنەکانی خوا بگۆڕێ بەرامبەر بەیارمەتی پێغەمبەران ﴿ولقد جاءك من نبإ المرسلين﴾ دیاریشە کە هەواڵی پەیامبەرانت پێگەیشتووە کەچۆن ئازاردران و، چۆنیش توانییان لەبەرامبەریەوە خۆ ڕاگرن هەتا سەرئەنجام کۆمەکی خوایان بۆ هات وسەرکەوتن ﴿[٣٥] وإن كان كبر عليك إعراضهم﴾ وئەگەر ڕوو وەرچەرخانی ئەوانەت لا گەورەوگران و قورس بوو ﴿فإن استطعت أن تبتغي نفقا في الأرض﴾ دەسا ئەگەر ئەتوانیت بچۆ لەزەوییدا زاغەو تونێلێك بۆ خۆت بکۆڵە ﴿أو سلما في السماء فتأتيهم بآية﴾ یان بچۆ پەیژەیەك بە ئاسمانەوە بنێ وپیا سەرکەوە، هەتا نیشانەو موعجیزەیەکی وایان بۆبێنی، بەڵکو ئەوانە بێنیتە ژێربارو بڕوات پێبکەن ، مەبەست ئەوەیە کە نایەوێ پەیامبەر ئەوەند سوورو بێتاقەت بێت بۆ بڕوا هێنانیان ﴿ولو شاء الله لجمعهم على الهدى﴾ وە نەبێت لەدەست دەرچووبن ، نەخێر، چونکە ئەگەر خوا ویستبای لەسەر ڕێگەی ڕاستیی و بەختیاریی بەزۆر هەموو کۆ بکاتەوە، زۆر بەئاسانی دەیکرد، بەڵام دەبێ باوەڕی وا چ کەڵکێکی هەبێ؟ ﴿فلا تكونن من الجاهلين﴾ جا ئیتر نابێ تۆ لەو کەسانە بیت کە حیکمەتی خوا لەوەدا نازانن کە بۆچی دەبێ مەردوم بە ئارەزووی خۆیان بڕوابێنن، نەك بە زۆر ﴿[٣٦] إنما يستجيب الذين يسمعون﴾ ئەمەیش بزانن کەبەڕاستیی تەنها ئەوانە وەڵام دەدەنەوەو باوەڕ دێنن کە بەدڵ گوێ دەگرن و دەبیسن ﴿والموتى يبعثهم الله﴾ ئەوکافرو خوانەناسانەش کە وەك مردوو وانەو باوەڕناهێنن، خوازیندوویان دەکاتەوە، دیارە ئەوانەی وابە دڵ نابیسن و بێ باوەڕن، وەکو مردوو کەڕوکاسن ولەهیچ شتێك حاڵی نابن ﴿ثم إليه يرجعون﴾ پاشانیش گشت دەگێڕڕێنەوە بۆلای خۆی و پاداشیان ئەداتەوە.

الجزء السابع سورة الأنعام

الحزب ١٤

۞ إِنَّمَا يَسْتَجِيبُ ٱلَّذِينَ يَسْمَعُونَ وَٱلْمَوْتَىٰ يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ ثُمَّ إِلَيْهِ
يُرْجَعُونَ ﴿٣٦﴾ وَقَالُوا۟ لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ ءَايَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ ۚ قُلْ إِنَّ ٱللَّهَ
قَادِرٌ عَلَىٰٓ أَن يُنَزِّلَ ءَايَةً وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٧﴾ وَمَا
مِن دَآبَّةٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا طَٰٓئِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلَّآ أُمَمٌ أَمْثَالُكُم ۚ
مَّا فَرَّطْنَا فِى ٱلْكِتَٰبِ مِن شَىْءٍ ۚ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يُحْشَرُونَ ﴿٣٨﴾
وَٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا صُمٌّ وَبُكْمٌ فِى ٱلظُّلُمَٰتِ ۗ مَن يَشَإِ ٱللَّهُ
يُضْلِلْهُ وَمَن يَشَأْ يَجْعَلْهُ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٣٩﴾ قُلْ
أَرَءَيْتَكُمْ إِنْ أَتَىٰكُمْ عَذَابُ ٱللَّهِ أَوْ أَتَتْكُمُ ٱلسَّاعَةُ أَغَيْرَ ٱللَّهِ
تَدْعُونَ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٤٠﴾ بَلْ إِيَّاهُ تَدْعُونَ فَيَكْشِفُ مَا
تَدْعُونَ إِلَيْهِ إِن شَآءَ وَتَنسَوْنَ مَا تُشْرِكُونَ ﴿٤١﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَآ
إِلَىٰٓ أُمَمٍ مِّن قَبْلِكَ فَأَخَذْنَٰهُم بِٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ لَعَلَّهُمْ يَتَضَرَّعُونَ
﴿٤٢﴾ فَلَوْلَآ إِذْ جَآءَهُم بَأْسُنَا تَضَرَّعُوا۟ وَلَٰكِن قَسَتْ قُلُوبُهُمْ
وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٤٣﴾ فَلَمَّا
نَسُوا۟ مَا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَٰبَ كُلِّ شَىْءٍ
حَتَّىٰٓ إِذَا فَرِحُوا۟ بِمَآ أُوتُوٓا۟ أَخَذْنَٰهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ ﴿٤٤﴾

١٣٢ فَقُطِعَ دَابِرُ

### موشریکەکان لەبەڵگەی تر دەگەڕێن:

﴿[٣٧] وقالوا لولا أنزل عليه آية من ربه﴾ بێباوەڕەکان وتیان: بۆچی جگە لەم قورئانە نیشانەو مرعجیزەیەکی تری لە لایەن پەروەردگاریەوە بۆ نەهاتە خوار، تاببێتە بەڵگەی ڕاستیی بۆی؟! ﴿قل إن الله قادر على أن ينزل آية﴾ پێیان بڵێ: بێگومانە کە خوا بە توانایە هەر بەڵگەو نیشانەیەك ئەوان داوای ئەکەن بینێرێ. ﴿ولكن اكثرهم لا يعلمون﴾ بەڵام زۆربەیان نازانن کەپاشەڕۆژیان چۆن ئەبێ ئەگەر ئەو نیشانەیەهات ، ئایا ئەمێننەوە، یا لەناو دەبرێن؟ ﴿[٣٨]

﴿وما من دابة فی الأرض﴾ گشت ڕەوکەر و گیانلەبەرێکی ئەم زەوییە ﴿ولا طائر یطیر بجناحیه﴾ هەموو باڵندەیەکیش کە بە دوو باڵان دەفڕێ ﴿إلا امم امثالکم﴾ هەمووئەمانە چەند ئوممەتێکن وەکو ئێوە دروستکراوی خوّمانن و یاسای تایبەتیمان داناوە بوّ ژیانیان و موتاجمانن ﴿ما فرطنا فی الکتاب من شئ﴾ لەهیچ شتێك کەمتەرخەمیمان نەکردووە لە (لوح المحفوظ)دا ﴿ثم إلی ربهم یحشرون﴾ لە پاشانیش هە موو بوّلای پەروەردگاریان کوّدەکرێنەوەو تویژینەوەیان لەگەڵ دەکرێ وپاداش وتوّڵە وەردەگرنەوە ﴿[٣٩] والذین کذبوا بآیاتنا﴾ ئەو کەسانەی ئایەتەکانی ئێمە بەدروّ دادەنێن و باوەڕیان پێناکەن ﴿صم وبکم فی الظلمات﴾ کەرو لاڵن لەناو تاریکاییەکاندا سووڕدەخوّن ﴿من یشإ الله یضلله﴾ خوا خوّی بیەوێ کەسێ گومڕا بکات، ئەیکات لەبەرلاساریی و سەرسەختی خوّی ﴿ومن یشأ یجعله علی صراط مستقیم﴾ حەزی لە هەرکەسیش بێ بیخاتە سەر ڕێگەی ڕاست، ئەوا بەئاسانی دەیخاتە سەر شارێگەکەی خوّی.

## ڕێنمایی ئایەتەکانی (٣٦-٣٩):

١- باوەڕ بەخواو بە دیداریی و، بە پێغەمبەرەکەی، بەختیاریی و سەرفرازیی هەردوو جیهانە، هەروەکو کوفرو بێ بڕوایی بەدبەختی وشەرمەزاری دنیاو قیامەتە، مروّڤی بڕوادار هەمیشە وریاو (زیندووە)و، بەرژەوەندی خوّی دەزانی لەچیدایە، خوا ئایەت و نیشانە نانێرێ- کە ئەوانە داوای بکەن- چونی هەر کە ناردیی و بڕوایان پێ نەکرد، لە ناو دەچن .

٢- جووڵندەو ئاژەڵ وگیان لەبەر، هەریەکەیان بوّخوّی ئوممەت وکوّمەڵێکن- وەکو ئێوە- وهەمویشیان ملکەچی فەرمان و بڕیارەکانی خوان .

٣- گشت ڕووداووگوّڕانکاریەکان لە (أم الکتاب)دان و، لەئەزەلدا هەر لەوێ بڕیاریان لەسەردراوە.

**کاتی سزا موشریکانیش لەخوا دەپاڕێنەوە:**

﴿[٤٠] قل ارایتم إن اتاکم عذاب الله﴾ بەو موشریکانە بڵێ: پێم بڵێن: ئەگەر سزای خواتان بوّهات ﴿اواتتکم الساعة﴾ یان قیامەتتان هات ﴿اغیرالله تدعون إن کنتم صادقین﴾ ئاخوّ - لەوکاتەدا- جگە لە خوا هاوار بوّ کەسی تر دەبەن فریاتانکەوێت , ئەگەر ڕاست دەکەن ئەڵێن بتەکان کەڵك بەخشن؟ ﴿[٤١] بل إیاه تدعون﴾ نا، تەنها هاوار لە خوا ئەکەن ﴿فیکشف ما تدعون إلیه إن شاء﴾ ئەوسا ئەویش ئەگەر ویستی و ئارەزووی هەبوو، ئەوا نزاکەتان گیرا دەکا و، دەرووتان لێ دەکاتەوەو کوّسپەکەتان بوّ تەخت دەکات ﴿وتنسون ما تشرکون﴾ ئەو بتانەیش ئێستا بە هاوبەشی خوایان دادەنێن لەو ڕوّژەدا لەبیریان دەکەن ﴿[٤٢] ولقد ارسلنا إلی امم من قبلك﴾ سوێند بە خوا بەر لەتوّش ئەی پێغەمبەر!ﷺ پەیامبەرێکی زوّرمان ناردە لای گەلانی پێشووو باوەڕیان پێ نەهێنان ﴿فأخذناهم بالبأساء والضراء﴾ ئینجا ئێمەیش بە هەژاریی وبە نەخوّشیی وبەجوّرەها بەڵای تر قارمان لێگرتن ﴿لعلهم یتضرعون﴾ تا بەڵکو سەردانەوێنن بوّ پەروەردگاریان و بێدار ببنەوەو ڕومان لێ بنێنەوە ﴿[٤٣] فلولا إذ جاءهم بأسنا تضرعوا﴾ دەسا کە سزاکەمان ئەوقەیان بووو قارمان لێگرتن، بوّ لەبەرمان نە پاڕانەوەو خوّیان نەدا بە دەستەوە، هەتا ئێمەیش ڕزگاریان بکەین ؟ ﴿ولکن قست قلوبهم﴾ ئەوەیان نەکرد، بەڵکو لە باتی ئەوە دڵیان ڕەشەوە بووو لەسەر بێ باوەڕییان سوورتر بوون ﴿وزین لهم الشیطان ما کانوا یعملون﴾ شەیتانیش ئەو شیرك وتاوانانەی لەسەری بوون بوّی ڕازاندنەوەو لە پێش چاوی جوانکردن وهەروا لەسەر بێ باوەڕیی مانەوە ﴿[٤٤] فلما نسوا ما ذکروا به﴾ جا کە ئەو هەموو ئاموّژگاریەیان لەبیر خوّبردەوە کە لەسەر زمانی پەیامبەران کرابوون ﴿فتحنا علیهم ابواب کل شئ﴾

ئینجا ئێمەیەش بۆ خەفلاندنیان و، وەك (إستدراج)ێکیش، دەروازەی هەموو خێرێکمان بۆ والاکردنەوەو ڕزق وڕۆزییەکی فرەمان ڕشت بەسەریانداو، ئەوانیش خۆشیی ونیشوە گرتنی ﴿حتى إذا فرحوا بما أوتوا﴾ هەتا بەومالْ و منداڵەی پێماندابوون، دەعیەو فیزگرتنیی و لەرێی ڕاست لایاندا ﴿أخذنا هم بغتة فإذا هم مبلسون﴾ ئەوسا ئێمەیش کتوپڕێك قارمان لێگرتن و، ئەوانیش لەوهەموو خۆشگوزەرانیە بیّ هیوا و ناهۆمید بوون ﴿٤٥ فقطع دابر القوم الذين ظلموا﴾ ئینجا ئەوانەی کە ناهەقیی وستەم پیشەیان بوو، هەموو خێرو خۆشیەکیان لەکیس چوو و دوا براوبوون ﴿والحمد لله رب العالمين﴾ سوپاس و ستایشی بیّ پایانیش بۆخوای پەروەردگاری جیهانەکان، دەسا تۆش ئەم بەسەرهات و ڕووداوانە بۆ ئوممەتەکەت بگێڕەوە، بەڵکو عیبرەتی لێوەرگرن.

الجزء السابع — سورة الأنعام

فَقُطِعَ دَابِرُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ۚ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٥﴾
قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَخَذَ ٱللَّهُ سَمْعَكُمْ وَأَبْصَٰرَكُمْ وَخَتَمَ عَلَىٰ قُلُوبِكُم
مَّنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِهِ ۗ ٱنظُرْ كَيْفَ نُصَرِّفُ ٱلْءَايَٰتِ
ثُمَّ هُمْ يَصْدِفُونَ ﴿٤٦﴾ قُلْ أَرَءَيْتَكُمْ إِنْ أَتَىٰكُمْ عَذَابُ ٱللَّهِ
بَغْتَةً أَوْ جَهْرَةً هَلْ يُهْلَكُ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٧﴾ وَمَا
نُرْسِلُ ٱلْمُرْسَلِينَ إِلَّا مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ ۖ فَمَنْ ءَامَنَ وَأَصْلَحَ
فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٤٨﴾ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا
يَمَسُّهُمُ ٱلْعَذَابُ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴿٤٩﴾ قُل لَّآ أَقُولُ لَكُمْ
عِندِى خَزَآئِنُ ٱللَّهِ وَلَآ أَعْلَمُ ٱلْغَيْبَ وَلَآ أَقُولُ لَكُمْ إِنِّى مَلَكٌ ۖ
إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ ۚ قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ ۚ
أَفَلَا تَتَفَكَّرُونَ ﴿٥٠﴾ وَأَنذِرْ بِهِ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَن يُحْشَرُوٓا۟
إِلَىٰ رَبِّهِمْ ۙ لَيْسَ لَهُم مِّن دُونِهِۦ وَلِىٌّ وَلَا شَفِيعٌ لَّعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ
﴿٥١﴾ وَلَا تَطْرُدِ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِىِّ يُرِيدُونَ
وَجْهَهُۥ ۖ مَا عَلَيْكَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَىْءٍ وَمَا مِنْ حِسَابِكَ
عَلَيْهِم مِّن شَىْءٍ فَتَطْرُدَهُمْ فَتَكُونَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٢﴾

١٣٣

**ڕێنمایەکانی ئایەتی (٤٠-٤٥):**

١- مرۆڤی موشریك وخوانەناس زۆر سەیروسەمەرەیە! کاتیّ نەهامەت و تەنگانەیەك دەبینیّ، بەهەڵەو دەوان هاوار دەبات بۆخوای گەورە، هەرکە ڕزگاریشی بوو، خێرا ڕوو وەردەگێریّ و پشت دەکاتەوە خوا!!

٢- ئوممەتان و گەلانی یاخیی هەرکە لاڕیّ و کلابوون و، خواش تۆڵەیدان وهەر ژێر نەبوون و نەگەڕانەوە بۆ ڕێی ڕاست، هێمان هەر لەگەڵ ئەوەشدا خوا دەرگای ڕسق و ڕۆزییان لیّ والاّ دەکا و گوزەرانیان خۆشتر دەکا، خۆ دیارە کەکاری وا خەفلاندن و(ئیستدراج)ـە، ئەگینە کتوپڕ دەیانگریّ وقڕیان دەکاو لەناو دەچن . پێشەوا (ئەحمەد) لە (عوقبەی کوڕی عامیر)ەوە دەگێڕێتەوە کە: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((إذا رأيت الله يعطي العبد من الدنيا على معاصيه ما يحب، فإنما هو إستدراج، ثم تلا رسول الله ﷺ (فلما نسوا ما ذكروا به فتحنا عليهم أبواب كل شئ حتى إذا فرحوا بما أوتوا أخذناهم بغتة فإذاهم مبلسون). واتە: هەرکە دیتت کەخوا نیعمەت و ڕۆزی بەوخەڵکە یاخیی و نافەرمان بەرانەدا، چاك بزانە کە ئەوە (ئیستیدراج)ـەو، وردە وردە بەماڵ و سامان و کوڕو ئەولاد سەریان دەخاو، کتوپڕ لێیان دەسێنێتەوەو دەیانگریّ و ڕزگاربوونیان نییە، پاشان ئەم ئایەتەی: (فلما نسوا ما ذكروا به..) خوێندەوە.

٣- بەڵێ قڕبوون و تیاچوونی ستەمکاران گشت لە شووم و بەدفەڕی خۆیانەوەیە.

٤- گوتنی زیکری (الحمدلله) لە ئاخرو کۆتایی هەمووکارێکی خێرەوە سوننەتە.

﴿٤٦ قل أرايتم إن أخذ الله سمعكم وابصاركم﴾ بەو بیّ باوەڕە یاخییانە بڵیّ: باشە! ئەگەر خوا هەستی گویّ و چاو و بیستن و دیتنتانی وەرگرتەوە ﴿وختم على قلوبكم﴾ و مۆریشی بەسەر دڵتاندانا ﴿من إله غير الله يأتيكم به﴾ دەبیّ بێجگە لەخوا کیّ هەبیّ بتوانیّ بۆتانی بگێڕێتەوەو پێتان بداتەوە؟ ﴿انظركيف نصرف الآيات﴾ دەسا بڕوانە چۆن بەگشت جۆریّ بەڵگە دێنینەوە لەسەر یەکتاپەرستیی خۆمان ﴿ثم هم يصدفون﴾ کەچی لەگەڵ ئەو هەموو

بەڵگانەدا هەر ڕوو وەردەگێڕن لەهەق و ڕاستیی!! ﴿٤٧ قل ارايتكم إن أتاكم عذاب الله بغتة او جهرة﴾ پێم بڵێن: ئەی ئەگەر لە ناکاو، یان بەئاشکرا بەڵاو سزای خواتان بۆ هات ﴿هل يهلك إلا القوم الظالمون﴾ بێجگە لە ستەمکاران دەبێ کێی تر تیابچێت؟ واتە: هەر ئێوە تیا دەچن ﴿٤٨ وما نرسل المرسلين إلا مبشرين و منذرين﴾ پەیامبەرانیش هەر بە مژدەدەر و ترسێنەردەنێرین ﴿فمن آمن واصلح﴾ جا هەرکەسێك باوەری هێناو ئاکاری چاکی ئەنجامدا، واتە: دوای ئەو پێغەمبەرانە کەوت ﴿فلا خوف عليهم ولا هم يحزنون﴾ ئیتر نە لەهیچ شتێك ترسیان دەبێ بۆ پاشە ڕۆژیان، وەنە هەرگیز خەفەتباریش دەبن بۆ دونیایان ﴿٤٩ والذين كذبوا بآياتنا﴾ ئەو کەسانەش کە بەڵگەو نیشانەکانی ئێمە بەدرۆ دادەنێن و، بەدوای پێغەمبەراندا ناچن ﴿يمسهم العذاب بما كانوا يفسقون﴾ بەهۆی لەسنووردەرچونیانەوە سزایان ئەوقە دەبێ.

### پێغەمبەر کلیلداری گەنجینەکانی خوا نیە :

﴿٥٠ قل لا أقول لكم عندى خزائن الله﴾ پێیان بڵێ: خۆ من بەئێوە ناڵێم کلیلداری گەنجینەکانی خوام، تاهەرچیم لێ بخوازن بتوانم جێبەجێی بکەم ﴿ولا اعلم الغيب﴾ ناشڵێم لەگشت غەیب و نادیارێك دەزانم، هەتا ئاگاداری هەموو شتێکبم ﴿ولا أقول لكم إني ملك﴾ ناشڵێم من فریشتەم، بەڵکو هەر ئادەمیم ﴿إن اتبع إلا ما يوحى إلي﴾ پەیڕەویی هەر لەو وەحی و نیگایەش دەکەم کە خوا بۆم دەنێرێ ﴿قل هل يستوى الأعمى والبصير﴾ دەسا بڵێ: ئاخۆ نابیناو بینا وەکو یەکن ؟! واتە: پەیڕەوانی هەق و پەیڕەوانی ناهەق، یان بڵێن: بێ باوەڕو بڕوادار وەکو یەکن ؟! ﴿افلا تتفكرون﴾ دە بۆچی بیر ناکەنەوە؟ ﴿٥١ وانذر به الذين يخافون ان يحشروا إلى ربهم﴾ تۆ بەم قورئانە ئەوکەسانە بترسێنە کە دەترسن ڕۆژێك پێشبێت لای پەروەردگاریان کۆبکرێنە ﴿ليس لهم من دونه ولى ولا شفيع﴾ ودەشزانن کەجگە لەویش هیچ دۆست و یارمەتیدەرو تکاکارێکیان نیە ﴿لعلهم يتقون﴾ بەشکو "لەم دنیایەدا"لە خوا بترسن و، کارێکی باش بکەن بۆقیامەتیان . هاوبەشدانەرەکان - وەکو(ئیبن ماجە و ئیبن جەریر)دەڵێن- ئەو دەمە کە (صوهەیب وعەممارو بیلال و خەبباب)، و دەستەیەکی تر لەموسڵمانە بێ نەواو هەژارەکان , لە دانیشتنەکانی پێغەمبەرداﷺ ئامادە دەبوون، وتیان: دەبێ تۆ ئەوانە لەخۆت دوور بخەیتەوەو نەیێنە لات, ئەوجار ئێمە دێینە لات و شوێنیشت دەکەوین ! ئیتر ئەم ئایەتە هات و فەرمووی: ﴿٥٢ ولا تطرد الذين يدعون ربهم بالغداة والعشى﴾ تۆهەرگیز ئەوکەسانە تارمەنێ کەبە بەیانیان و ئێواران یادی پەروەردگاریان دەکەن ﴿يريدون وجهه﴾ و بەدڵ و دەروونیش هەر ڕەزامەندی ئەویان ئەوێ ﴿ماعليك من حسابهم من شئ﴾ چونکە تۆ هیچ کارت بەکاری ئەوانەوە نییە ﴿وما من حسابك عليهم من شئ﴾ و ئەوانیش هیچ کارێکیان بەسەر تۆوە نییە، بەڵکو حیسابی هەردوولاتان لای خوایە ﴿فتطردهم فتكون من الظالمين﴾ تاریان مەنێ بانەچیتە ڕیزی ستەمکارانەوە. لەم ئایەتەدا خوای گەورە ومیهرەبان ڕێ لە پەیامبەرﷺ دەگرێ کە ئەو موسڵمانە کزو لاوازانە بتۆرێنێ، دیارە کەئایەتی (١٨/٢٨): (واصبر نفسك)، وە (٦/٥٢): (وإذا جاءك الذين يؤمنون..)، وە ئایەتی (١١/٢٩): (وما انا بطارد الذين آمنوا..)، وە ئایەتی (١١/٣٠): (وما انا بطارد المؤمنين..)، وە ئایەتی (١١/٣٠): (وياقوم من ينصرنى من الله إن طردتهم..) گشت ئەمانە بۆ پشتگیریی و دووپاتکردنەوەی ئەو مەبەستەیە ﴿٥٣ وكذلك فتنا بعضهم ببعض﴾ ئێمە هەر ئابەوشێوەیە هەندێکیان بە هەندێکی دی تاقیدەکەینەوە، دەوڵەمەند بەهەژار، بێ پایە بە پایەدار ﴿ليقولوا أهؤلاء من الله عليهم من بيننا﴾ هە تا دەڵێن: ئاخۆ خوا لە نێوانماندا ئەمانەی بەرچاکەی خۆی خست و منەتی نایە سەریان و هەڵیبژاردن بۆ ئیمان وباوەڕ؟! واتە: ئێمە شایستەی ئەومنەتەبووین کەخوا هیدایەتمان بدات، نەك ئەوخەڵکەلات ولاوازە ﴿اليس

**الله بأعلم بالشاكرين﴾** ئاخۆ خوا لەوان باشتر سوپاسکاران ناناسیێ؟ حیکمەتی خوێ وایە کەخەڵکیی بەیەکتر تاقیی بکاتەوە: هەندێکی بەدەوڵەمەندیی ومالْ و دارایی، هەندیکیشی بە پێغەمبەرێتی پلەو مەقام، موشریکەکانیش بە نەزانی خۆیان لە خۆبایی بوون و رەخنەیان لە هەژارەکان گرت، ماناو مەبەستی ئەم ئایەتانەش کە دەفەرموون: (٦/٥٣): (کذلك فتنا بعضهم ببعض..)، (وقال الذین کفروا..ما سبقونا إلیه..)، (أی الفریقین خیر مقاما واحسن ندیا) (٧٣/١٩). ئەو حەقیقەتە دووپات دەکەنەوە.

## رێنمایەکانی ئایەتی (٥٠ - ٥٣):

١- پێغەمبەران گشت بنیادەمن.

٢- پێغەمبەر ﷺ نە(غەیب) دەزانێ و، نەدەشتوانێ دەسکاری بوونەوەر بکا.

٣- مرۆڤی ئیماندار وبێ ئیمان وەکویەك نین، موسڵمان بە چاوساغ و بینادادەنرێت ، کافریش وخوانەناسیش بە کوێرو نابینا.

٤- پێکەوەژیان لەگەڵ خەڵکانی هەژارونەبووو، ئەهلی تەقواو بڕوادار رەوشتێکی بەرزی دینی ئیسلامەو، بە سوننەتی داوەتە قەڵەم.

٥- دەوڵەمەندیی و هەژاریی ، پایەداریی و بێ پایەیی، هێزداریی و بێ هێزیی، ئەمانە گشت بۆ تاقیکردنەوەن.

٦- هەر خەڵکانی شوکرانە بژێر شیاون چاکەیان لەگەڵ بکرێ.

سُورَةُ الأَنعَامِ | الجُزءُ السَّابِعُ

وَكَذَٰلِكَ فَتَنَّا بَعۡضَهُم بِبَعۡضٖ لِّيَقُولُوٓاْ أَهَٰٓؤُلَآءِ مَنَّ ٱللَّهُ
عَلَيۡهِم مِّنۢ بَيۡنِنَآۗ أَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِأَعۡلَمَ بِٱلشَّٰكِرِينَ ٥٣ وَإِذَا
جَآءَكَ ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِـَٔايَٰتِنَا فَقُلۡ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡۖ كَتَبَ
رَبُّكُمۡ عَلَىٰ نَفۡسِهِ ٱلرَّحۡمَةَۖ أَنَّهُۥ مَنۡ عَمِلَ مِنكُمۡ سُوٓءَۢا
بِجَهَٰلَةٖ ثُمَّ تَابَ مِنۢ بَعۡدِهِۦ وَأَصۡلَحَ فَأَنَّهُۥ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٥٤
وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ وَلِتَسۡتَبِينَ سَبِيلُ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ٥٥
قُلۡ إِنِّي نُهِيتُ أَنۡ أَعۡبُدَ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِۚ قُل لَّآ أَتَّبِعُ
أَهۡوَآءَكُمۡ قَدۡ ضَلَلۡتُ إِذٗا وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُهۡتَدِينَ ٥٦
قُلۡ إِنِّي عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّي وَكَذَّبۡتُم بِهِۦۚ مَا عِندِي مَا
تَسۡتَعۡجِلُونَ بِهِۦٓۚ إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۖ يَقُصُّ ٱلۡحَقَّۖ وَهُوَ خَيۡرُ
ٱلۡفَٰصِلِينَ ٥٧ قُل لَّوۡ أَنَّ عِندِي مَا تَسۡتَعۡجِلُونَ بِهِۦ لَقُضِيَ
ٱلۡأَمۡرُ بَيۡنِي وَبَيۡنَكُمۡۗ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِٱلظَّٰلِمِينَ ٥٨
الحزب ١٤ ۞ وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلۡغَيۡبِ لَا يَعۡلَمُهَآ إِلَّا هُوَۚ وَيَعۡلَمُ مَا فِي
ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِۚ وَمَا تَسۡقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعۡلَمُهَا وَلَا حَبَّةٖ
فِي ظُلُمَٰتِ ٱلۡأَرۡضِ وَلَا رَطۡبٖ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٖ ٥٩

وَهُوَ الَّذِي | ١٣٤

﴿٥٤ وإذا جاءك الذین یؤمنون بآیاتنا﴾ تۆش هەرکات ئەوکەسانە کە بڕوا بە نیشانەکانی ئێمە دێنن دێنە لات ﴿فقل سلام علیکم﴾ رێزیان لێبگرەو بە سنگێکی فراوانەوە بڵێ: سڵاوتان لەسەر بێت ﴿کتب ربکم علی نفسه الرحمة﴾ دڵنیابن کە پەروەردگارتان لەسەر خۆی نوسیوە بەبەزەیی و بە رەحم بێت لەگەڵتان ﴿انه من عمل منکم سوءا بجهالة﴾ و هەرکەسێکیشتان لەنەزانی خۆیەوە گوناهێ بکا ﴿ثم تاب من بعده واصلح﴾ لەپاشان پەشیمان ببێتەوەو ئاکاری چاك رەچاو بکات ﴿فانه غفور رحیم﴾ بەڕاستیی خوایش لەبەرامبەر ئەوکەسەوە زۆر پۆشندەو لێبوردەیە بۆ گوناحانیان، زۆریش میهرەبان و دلۆڤانە ﴿٥٥ وکذلك نفصل الآیات﴾ ئێمە هەرئا بەو شێوەیە هەمیشە ئایەت و بەڵگەکانی خۆمان بۆمرۆڤەکان روون ئەکەینەوە بەشکوم شوێنی هەق بکەون ﴿ولتستبین سبیل المجرمین﴾ دەشمانەوێ رێگەو رێبازی تاوانباران روون بێت وهەقیش ئاشکرا ببێ ﴿٥٦ قل إنی نهیت ان اعبد الذین تدعون من دون الله﴾ بەو موشریکانە بڵێ: بەڕاستیی من رێم پێنەدراوە ئەوشتانە بپەرستم کە ئێوە لەباتی خوا ئەیانپەرستن ﴿قل لا اتبع اهواءکم﴾ پێشیان بڵێ: من هەرگیز لە هەواو ئارەزووی ئێوە

پەیڕەوی ناکەم ﴿قد ضللت إذا﴾ دڵنیام کە ئەگەر وابکەم لاڕێ ئەبم و ڕێگەی ڕاست ون ئەکەم ﴿وما انا من المهتدین﴾و لەسەر ڕێگای ڕاست نابم.

**پێغەمبەر بەڵگەی بەهێزی هەیە:**

﴿٥٧ قل إنی علی بینة من ربی﴾ پێیان بڵێ: بێگومانبن کە من لەلایەن پەروەردگارمەوە بەڵگەی پتەوم پێیە بۆ بڕواهێنان، قورئانم بۆهێناون ﴿وکذبتم به﴾ کەچی ئێوە بڕواتان پێنەکردو بە درۆتان دانا !﴿ماعندی ما تستعجلون به﴾ ئەوبەڵاو سزایەش ئێوە بەپەلەن بۆی لای من نییە ﴿إن الحکم إلا لله﴾ چونکە هەموو حوکم و بڕیارێك هەر هی خوایە، هەمووشتێ هەر بەدەستی ئەوە ﴿یقص الحق﴾ وهەر ئەویشە هەق شیتەڵ وبەیان دەکا ﴿وهو خیر الفاصلین﴾ هەرئەویشە بە باشترین شێوە هەق و ناهەق لێکدەکاتەوە، هەرئەویشە دەتوانێ تۆڵە و سزای تاوانباران بداو، ستەمیش لەکەس نەکات، دیاریکردنی کات و ڕۆژی هاتنی سزاکەش تەنها لای خوایە، وەکو لەم سوورەتەو، لەچەند سوورەتێکی تردا ئەفەرموێ: (قل لو أن عندی ما تستعجلون به..) (٦/٥٨)، وەئایەتی (٢٩/٥٤) و (١٠/٥٠) و (٢٩/٥٣) ئەمانە هەموو دووپاتی ئەو ڕاستییە دەکەنەوە ﴿٥٨ قل لو أن عندی ماتستعجلون به﴾ پێیان بڵێ: ئەگەر ئەو سزایە وا ئێوە بە پەلەن بۆی لای من بوایە ﴿لقضی الأمر بینی وبینکم﴾ ئەوا کاری من و ئێوە هەرزوو یەکلا دەبووەوەو سزاتان بۆ دەهات ﴿والله أعلم بالظالمین﴾ خواش لەهەموو کەس بە موشریکان و ستەمکاران زاناترە. خاتوو عائیشە –خوا لێی ڕازی بێت– لەپێغەمبەر ﷺ دەپرسێت: ئاخۆ ڕۆژێکی سەختترت وەکو (ئوحود) دیتبێ؟ فەرمووی بەڵێ: ئەوی لەلایەن قەومەکەی تۆوە (ڕۆژی عەقەبە) تووشم بوو، سەختتر بوو لەڕۆژی ئوحود، چونکە داوام لە(ئیبن عەبد یالیل)ـی سەرکردەی (تاییف) کرد پەنام بدا، پەنای نەدام، ئیتر منیش زۆر بێتاقەت بووم و ئۆقرەم نەگرت، هەتا چوومە(قرن الثعالب/شوێنێکە شەوو ڕۆژێ لەمەککەوە دوورە) پاشان سەرم بەرزکردەوە دەبینم هەورێك بەڕا سەرمەوەیە و سێبەری بۆ کردوم و، جوبریلی تێدایە و پێیگوتم: خوا قسەو گوفتاری ئەوانەی بیست، ئەوا ئێستاش فریشتەی وێرانکەرو تێکدەری شاخەکانی ناردۆتە لات، چ فەرمانێکی پێدەکەی ئامادەیە، فریشتەیەکەیش سڵاوی کردو گوتی: ئەر دەڵێیت ئەو دوو شاخە دەدەم بەسەریاندا، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: نە، شتی وامەکە ، بەشکوم لەئایینەدەدا خوای گەورە لەنەوەو زاڕۆڵەی ئەمانە، نەوەو وەچەیەکی وا بەدی بێنێت ،کە زۆربەڕێك وپێکی خوا بپەرستن/متفق علیه. بەڵێ بەپێی ڕواڵەت ئایەتی: (قل لوان عندی ماتستعجلون..) و ئەو فەرموودە خاتوو عاییشە گێڕایەوە، یەکناکەون و ناکۆکن، چونکە ئایەتەکە دەڵێت: ئەرئەوسزایە –ئەوانە بەتالووکەن بۆی– بەدەستی موحەممەد بووبا، کار لەکار دەترازاو تیادەچوون، فەرموودەکەیش دەڵێ: خوای گەورە فریشتەی ناردوو کارەکەی خستە بەر دەستی پێغەمبەر کە: ئەر مەیلی ببێ دەتوانێ فەرمان بەو فریشتەیە بدات: شاخەکە بکوتێ بەسەریاندا، کەچی میهرەبانی نواند و ڕێی نەدا بەوکارەیە. (ئیبن کەسیر) بۆیەکخستنی نێوان ئەم ئایەت وفەرموودەیە دەڵێ: ئەوسزایە لە ئایەتەکەدایەو ئەوان داوایانکرد، دیارە کەبەدەستی پێغەمبەر نیە، بۆیە فەرمووی: ئەگەر بەدەست من بووبا بەپەلە بۆم دەهێنان، بەلاّم لەفەرموودەکەدا وا هاتووە کە ئەوان داوای سزایان نەکردووە، بەڵکو خوای میهرەبان لەلایەن خۆیەوە بەزەیی جووڵاو فرشتەکەی ناردو ئەویش گوتی: ئەر فەرمان بدەیت ئەو دوو شاخە دەکوتم بەسەریاندا پێغەمبەریش قەبووڵی نەکرد، کەوابوو هیچ ناکۆکییەك لەنێوانیاندا نیە.

**ڕێنمایەکانی ئایەتی (٥٤–٥٨):**

١– پێویستە لەگەڵ پرسیارکەراندا هەمیشە نەرم ونیان و لەسەر خۆبین و توندو سەختگیری نەکەین.

٢- پەیڕوانی هەواو ئارەزوو باتڵ، زوو تووش دەبن و تیادەچن.

٣- موسڵمانی بانگبەری ئیسلام دەبێ خوا بە هەموو سیفەتەکانیەوە چاك بناسێت .

٤- هەڵگرانی مەشخەڵی بانگەوازو گەیاندنی دینی خوا، دەبێ لە بەرامبەر گشت ڕووداوو گیروگرفتەکانەوە زۆربەئارام و خۆڕاگربن.

﴿٥٩ وعنده مفاتح الغيب لا يعلمها إلا هو﴾ کلیلی گشت گەنجینەکانی غەیب، تەنها لای خوایەو، تەنها هەر ئەویش پێیان دەزانێت و، تەواوی کارە نادیارەکانیش لای ئەوئاشکراو دیارن، ئیمامی (بوخاریی و، پێشەوا ئەحمەد) ئەم فەرموودەیە دێنن کە: خاتوو (عائیشە) دەڵێ: ((من زعم أن رسول الله ﷺ خبير بما يكون في غد، فقد أعظم على الله الفرية، والله يقول:((قل لا يعلم من في السموات والأرض الغيب إلا الله)) أخرجه مسلم. بەڵێ پەیامبەری خوا ﷺ دەبێ بەراشکاوی بەهەموو مەردم بڵێ: من هیچ کاریکی غەیب و نادیار نازانم، بۆ یە خوا فەرمانی پێدەکات بڵێ: (قل لا أقول لكم عندي خزائن الله ولا أعلم الغيب..) خۆ ئەوکاتەش کەخاتوو عائیشە تۆمەتبارکراو، بوختانەکەی بۆهەڵبەسرا، پەیامبەر ﷺ ئەگەرچی بەهیچ شێوەیەك لێی بەدگومان نەبوو، بەڵام بەشێوەیەکی (عين اليقين)یش ئاگای لەهەواڵەکە نەبوو، هەتاخوا خۆی پاکانەی بۆکردو فەرمووی: (أولئك مبرؤن مما يقولون)، (ئیبراهیم)پێغەمبەر ﷺ ئەو کاتە فریشتەکان هاتنەلای، بەپەلە گوێلکێکی بۆ سەربڕین، چونکە نەیزانی فریشتەن، هەتا خۆیان وتیان: (إنا أرسلنا إلى قوم لوط) (١١/٧٠)، ئەوسا کەهاتنە لای (لووط)، ئەویش نەیزانی فریشتەن، بۆیە: (سئ بهم وضاق بهم ذرعا) (١١/٧٧) (یەعقوب)ﷺ لەبەر دووری یوسف (ئاوی مرواری) سەرچاوی گرت و کوێربوو، چونکە هیچ هەواڵێکی لێی نەبوو نەیئەزانی لەکوێیە؟ خۆ (سولەیمان)یشﷺ گشت شەیاتین و باکانی لەبەر دەستا بوو، کەچی هەواڵێکی ئەوتۆی لەخەڵکی (مەندەب)و هۆزی (بەڵقیس) نەئەزانی، تا پەپووسلێمانەکە هات، وتی: (أحطت بما لم تحط به وجئتك من سبإ بنبإ يقين) (٢٧/٢٢)(نووح) ﷺ ئەودەمە کەکوڕەکەی خنکاو هاواری لێ بەرزبوویەوە، نەیزانی ئیماندارو باوەڕدار نەبووە، بۆیە گوتی: (رب إن ابني من أهلي..) ئەوسا خوایش فەرمووی: (يانوح إنه ليس من أهلك..) (١١/٤٦)، جا کەوابوو گشت پەیامبەران و فریشتەکانیش، ئەگەر خوا لەنادیارو (غەیب) شتێکیان لێ بەئاگا نەکا، هیچ نازانن، وەکو لەجێگایەکی تردا دەفەرموێ: (.. وما كان الله ليطلعكم على الغيب..) (٣/١٧٩)، دیارە سەبارەت بەغەیب و نادیار جگە لەوەحی هەرچی بگوترێ کوفرو بێ باوەڕییە، بۆیە پێغەمبەر دەفەرموێ: ((من أتى عرّافا فسأله عن شئ لم تقبل له صلاة أربعين يوما)) أخرجه مسلم، وقال القرطبي: فمن قال إنه ينزل الغيث غدا، و جزم به فهو كافر، أخبر عنه بأمارة إدعاها أم لا؟ وكذلك من قال: إنه يعلم ما في الرحم فإنه كافر، فإن لم يجزم و قال: إن النوء، ينزل الله به الماء عادة، وأنه سبب الماء عادة، وإنه سبب الماء على ما قدره وسبق في علمه لم يكفر، إلا أنه يستحب أن لا يتكلم به).

عەڕراف: بەو کەسە دەڵێن: پێی وایەو دەڵێ: من هەموو کارێکی نادیارو غەیب دەزانم ! ﴿ويعلم ما في البر والبحر﴾ هەرچییش لە وشکانیی و دەریادایە ئەو ئەیزانێ ﴿وما تسقط من ورقة إلا يعلمها﴾ هیچ گەڵا دارێکیش بێ ئاگاداری ئەو ناوەرێت ﴿ولا حبة في ظلمات الأرض﴾ هەردانەیە کە لەناو تاریکایی زەوییدا بێ ﴿ولا رطب ولا يابس﴾ و هەرچی تەڕو وشکیشە ﴿إلا في كتاب مبين﴾ گشتی ئەوانە لەناو کتێبێکی ئاشکرادایە وەکو (لوح المحفوظ)، واتە: خوای کارزان بە گشت بوونەوەر -بەگیاندارو بێ گیانیەوە- زانست و زانیاریی هەیە .

**بەرلە مردن و دوای مردن هەرخوا خاوەنە :**

﴿<sup></sup>٦٠ وهو الذی یتوفاکم باللیل﴾ هەر ئەوخوایە کە بەشەودا دەتانخەوێنێ و، هەستان لێدەسێنێ و، وەك مردووتان لێدێت ﴿و یعلم ما جرحتم بالنهار﴾ وبەرۆژیشدا هەر تاوانێ بکەن پێیدەزانێ ﴿ثم یبعثکم فیە﴾ ئەوسا بەرۆژ راتاندەپەرێنێ و هەڵتان دەسێنێ ﴿لیقضی اجل مسمی﴾ تا ماوەی دیاریکراوی خۆی بەسەر دەچێ و، ئەگەنە کۆتایی تەمەنتان دەژین ﴿ثم إلیە مرجعکم﴾ لە پاشان دەتانمرێنێ و هەردەچنەوە لای خۆی ﴿ثم ینبئکم بما کنتم تعملون﴾ پاشانیش ئاگادارتان ئەکا لەهەرچی کردوتانە ﴿٦١ وهو القاهر فوق عبادە﴾ هەر خۆیەتی زاڵ و دەسەڵاتدار بەسەر بەندەکانییدا ئەگەر بیەوێ هەمووتەسلیم و ملکەچی فەرمانی ئەو ئەبن ﴿ویرسل علیکم حفظة﴾ فریشتەی چاودێرو پارێزەریشتان لەسەر دائەنێ و، لەجنیەکان دەتانپارێزن و، کردەوەکانیشتان دەژمێرن ﴿حتی إذا جاء احدکم الموت﴾ جاکە وەختی مردنی یەکێکتان هات ﴿توفتە رسلنا﴾ فریشتەکانمان گیانی دەکێشن ﴿وهم لا یفرطون﴾ خۆ لەجێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خوادا، هەرگیز کۆتایی و سستی ناکەن ﴿٦٢ ثم ردوا إلی الله مولاهم الحق﴾ لەپاشان دوای زیندووو بوونەوە هەموو دەگەڕێنەوە لای خوا، کەگەورەو سەروەری ڕاستەقینەی هەموانە ﴿الا لە الحکم﴾ دەبا گشت هۆشیار بن! کە داوەریی و بڕیار هەربەدەستی ئەوە ﴿وهو اسرع الحاسبین﴾ بە خێراتر لە هەرحیسابگرێکیش حیسابی گشتیان دەکا.

وَهُوَ ٱلَّذِي يَتَوَفَّىٰكُم بِٱلَّيۡلِ وَيَعۡلَمُ مَا جَرَحۡتُم بِٱلنَّهَارِ ثُمَّ يَبۡعَثُكُمۡ فِيهِ لِيُقۡضَىٰٓ أَجَلٞ مُّسَمّٗىۖ ثُمَّ إِلَيۡهِ مَرۡجِعُكُمۡ ثُمَّ يُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٦٠﴾ وَهُوَ ٱلۡقَاهِرُ فَوۡقَ عِبَادِهِۦۖ وَيُرۡسِلُ عَلَيۡكُمۡ حَفَظَةً حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَكُمُ ٱلۡمَوۡتُ تَوَفَّتۡهُ رُسُلُنَا وَهُمۡ لَا يُفَرِّطُونَ ﴿٦١﴾ ثُمَّ رُدُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ مَوۡلَىٰهُمُ ٱلۡحَقِّۚ أَلَا لَهُ ٱلۡحُكۡمُ وَهُوَ أَسۡرَعُ ٱلۡحَٰسِبِينَ ﴿٦٢﴾ قُلۡ مَن يُنَجِّيكُم مِّن ظُلُمَٰتِ ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِ تَدۡعُونَهُۥ تَضَرُّعٗا وَخُفۡيَةٗ لَّئِنۡ أَنجَىٰنَا مِنۡ هَٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٦٣﴾ قُلِ ٱللَّهُ يُنَجِّيكُم مِّنۡهَا وَمِن كُلِّ كَرۡبٖ ثُمَّ أَنتُمۡ تُشۡرِكُونَ ﴿٦٤﴾ قُلۡ هُوَ ٱلۡقَادِرُ عَلَىٰٓ أَن يَبۡعَثَ عَلَيۡكُمۡ عَذَابٗا مِّن فَوۡقِكُمۡ أَوۡ مِن تَحۡتِ أَرۡجُلِكُمۡ أَوۡ يَلۡبِسَكُمۡ شِيَعٗا وَيُذِيقَ بَعۡضَكُم بَأۡسَ بَعۡضٍۗ ٱنظُرۡ كَيۡفَ نُصَرِّفُ ٱلۡأٓيَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَفۡقَهُونَ ﴿٦٥﴾ وَكَذَّبَ بِهِۦ قَوۡمُكَ وَهُوَ ٱلۡحَقُّۚ قُل لَّسۡتُ عَلَيۡكُم بِوَكِيلٖ ﴿٦٦﴾ لِّكُلِّ نَبَإٖ مُّسۡتَقَرّٞۚ وَسَوۡفَ تَعۡلَمُونَ ﴿٦٧﴾ وَإِذَا رَأَيۡتَ ٱلَّذِينَ يَخُوضُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا فَأَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ حَتَّىٰ يَخُوضُواْ فِي حَدِيثٍ غَيۡرِهِۦۚ وَإِمَّا يُنسِيَنَّكَ ٱلشَّيۡطَٰنُ فَلَا تَقۡعُدۡ بَعۡدَ ٱلذِّكۡرَىٰ مَعَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٦٨﴾

١٣٥

**ڕێنمایەکانی ئایەتی (٥٩ – ٦٢):**

١– مەودای دەسەڵات و تواناو حیکمەتی خوای خاوەن بەزەیی بێ سنوورە.

٢– هەمووکارێکی غەیب و نادیار، دیارو ئاشکرا تەنیا خوا خۆی دەیزانێ.

٣– مەودای (قەزا) و(قەدەری) خوا هەمووشتێ دەگرێتەوە, تەنانەتی هەرگەڵادارێك لەدار بەربێتەوە, ئاگای لێیەتی.

٣– (مەعاد)و لێپرسینەوەو تۆڵەو پاداش، بڕیارێکی حەتمیی خوایەو هەر پێش دێت .

**بەخشش و کەرەمی خواو، هەڵمەت و قاری:**

﴿٦٣ قل من ینجیکم من ظلمات البر والبحر﴾ پێیان بڵێ: لە تاریکییەکانی وشکایی و، دەریادا، بەتایبەتی کاتێ ڕێتان لێ وندەبێ ، کێ ڕزگارتان دەکات؟ ﴿تدعونە تضرعا وخفیة﴾ ئەوکاتە کەبەگیردێن ، بە ئاشکراو بە نهێنی، بگرە بەهەموو شێوەیەك ، لێی دەپاڕێنەوەودەڵێن: ﴿لئن انجانا من هذە لنکونن من الشاکرین﴾ ئەگەرپەروەردگار ئەمجارەش لەم بەڵاو تەنگەژەیە ڕزگاریکردین ، پەیمان بێت لە شوکرانە بژێرانبین: ﴿٦٤ قل الله ینجیکم منها ومن کل

كرب﴾ بڵێ: لەو هەموو نارەحەتیی وتەنگەژەیەو، لەهەموو ئاستەنگێکی تریش، خوارزگارتان دەکات﴿ثم انتم تشرکون﴾ کەچی پاش ئەوە لەباتی سوپاسگوزاریی شەریك و هاوبەشی بۆ بڕیار ئەدەن!! ﴿٦٥ قل هو القادر﴾ بڵێ: دەسەڵاتی هەیەو دەشتوانێ ﴿علی أن یبعث علیکم عذابا من فوقکم﴾لەسەرووتانەوە سزایەکتان بۆ بنێرێ ، بەهەورە تریشقەو باوبۆران و..هتد ﴿اومن تحت ارجلکم﴾ یان لەژێر پیتانەوە بەبوومەلەرزەو رۆچوونی زەویی، گیرۆدەتان بکات ﴿اویلبسکم شیعا﴾ یان بتانکاتە چەند دەستەو بەستەیەکی ناکۆك و نەگونجاو لە گەڵ یەکتردا و، توشی کێشەو گرفتتان بکا ﴿و یذیق بعضکم بأس بعض﴾ وبەهەندێکتان ئازارو جەزرەبەی هەندێ بدا ﴿انظر کیف نصرف الآیات﴾ دەبڕوانە چۆن بە هەمووشێوەیەك بەڵگەو نیشانەیان بۆدەگۆڕین و نیشانیان دەدەین ﴿لعلهم یفقهون﴾ بەشکو تێبگەن و وردبنەوە لێیان و بگەڕێنەوە سەر ڕێی ڕاست وبەرنەبنە گیانی یەکتر.

رێنمایەکانی ئایەتی (٦٣-٦٥):

١- چ بەڵگەیەك لەمە بەهێز تربێت لەسەرناهەقیی و باتڵی (شیرك)ی (موشریکان) کە: دەبینی لە کاتی تەنگانە و تەنگژەدا، هاوار هەربۆ خوای گەورە ئەبەن ،چونکە دەزانن پەنادەرو ڕزگارکەر لەکاتی بەڵاو موسیبەتدا تەنیا خوایە.

٢- وشیاربوونەوەو، خۆپاراستن لەهەر ئیختیلاف و کێشەیەك سەر بکێشی بۆ بەشبەشبوون و کوتلە بەندیی، ئیمامی موسلیم ئەم فەرموودە دێنێ :((إن الله زوی لی الأرض (أی جمعها) فرأیت مشارقها و مغاربها، وإن أمتی سیبلغ ملکها مازوی لی منها، وأعطیت الکنزین الأحمر والأبیض ، وإنی سألت ربي لأمتی الا یهلکهم بسنة مجاعة، ولا یسلط علیهم عدوا من سوء أنفسهم فیستبیح بیضتهم ، وإن ربی قال لی یامحمد! إنی إذا قضیت قضاءفإنه لایرد، وأنی أعطیتك لأمتك الا أهلکهم بسنة عامة، والا أسلط علیهم عدوا من سوی انفسهم یستبیح بیضتهم ولو اجتمع علیهم من بأقطارها، أو قال:من بین اقطارها حتی یکون بعضهم یهلك بعضا، ویسبی بعضهم بعضا)).مەبەست لەم فەرموودە ئەمەیە کەگەل و نەتەوەی موسڵمان ، هەتا یەك ڕیزو یەك دەست بن و، نەبنە چەند دەستەو بەستەیەك، هیچ هێزێك ناتوانێ زاڵ ببێ بەسەریاو، ببنە دیل و کۆیلەی ژێردەستیان.

﴿٦٦ وکذب به قومك وهو الحق﴾ وقورەیشی هۆزت (ئەی پێغەمبەر!) ئەم (قورئان)ەیان بە درۆداناو، بڕوایان پێنەکرد، خۆ دیاریشە کە هەرقورئان ڕاست و دروستە ﴿قل لست علیکم بوکیل﴾ پێیانبڵێ: خۆ من بەرپرس و چاودێری ئێوەنیم، تا بەزۆر بڕواتان پێ بێنم ﴿٦٧ لکل نبامستقر﴾ هەمووکارو هەواڵێکیش لای خوا کاتی خۆی هەیەو، ئەمرۆ یاسبەینێ هەر پێشدێت، ئەوسا هەموو ڕاست و ناراستێك دەرئەکەوێ ﴿وسوف تعلمون﴾ لەئاییندە شدا چاك ئەزانن کە ئاوایە.

**لەگەڵ ئەوانەدا لەئایەتەکانی خوا خراپ دەدوێن دامەنیشە :**

﴿٦٨ وإذا رأیت الذین یخوضون فی آیاتنا﴾ هەر کە ئەو موشریکانەت دیت خەریکن لەبارەی ئایەت و نیشانەکانی ئێمەوە خراپ دەدوێن و گاڵتە دەکەن ﴿فاعرض عنهم﴾ ڕوویان لێ وەرچەرخێنەو، خێرا هەستەوجێیان بهێڵە ﴿حتی یخوضوا فی حدیث غیره﴾ تا قسەکەیان ئەگۆڕن و واز لەو گاڵتەو مەسخەرە دێنن ﴿وإما ینسینك الشیطان﴾ ئەگەر شەیتان ئەم ئامۆژگاریەشی لەبیربردیتەوەو لەگەڵیان دانیشتیت ﴿فلا تقعد بعد الذکری مع القوم الظالمین﴾ جا دوای ئەوە ، هەرکە بە بیرت هاتەوە، ئیتردوای ئەوەنابێ لەگەڵ ئەوخەڵکە ستەمکارە دانیشێ، بەڵکو دەبێ زووجێیان بهێڵی ﴿٦٩ وما علی الذین یتقون من حسابهم من شئ﴾ ئەو کەسانە کە لەوانە خۆ دوور دەگرن و،

پارێز ئەکەن وهەرگیز ناچنە کۆڕەکانیانەوە، ئیتر هیچ حیساب و گوناهێکی ئەوانەیان لە ئەستۆ نابێ، ئەگەر لاقرتیش بکەن ﴿ولكن ذكرى لعلهم يتقون﴾ بەلاَم لەگەڵ ئەوەیشدا ئێمە هەر فەرمان دەدەین کە ئێوە دوور بن لێیان، بەڵکو بیری بکەنەوەوخۆ پارێزن لە گاڵتە ومەسخەرەکردن بەدینی ئیسلامی پیرۆزوقورئانی بەفەڕ. (سەعدی) ئەڵێ: کەخراپکاران ئێوە ببینن لەگەڵیان دادەنیشن، ئیتر هیچ شەرمێکتان لێ ناکەن و لە گاڵتە کردن ومەسخەرە بەقورئان کۆڵ نادەن. (قورتوبی) ئەڵێ: (فی هذه الآية رد على من زعم أن الأئمة الذين هم حجج وأتباعهم، لهم أن يخالطوا الفاسقين و يصوّبوا آراءهم تقية. وقال الطبرى: لا تجالسوا أهل الخصومات. قال ابن العربى: هذا دليل على أن مجالسة أهل الكبائر لا تحل. وقال ابن خويزمنداد: من خاض فى آيات الله "مؤمنا أوكافرا" تركت مجالسته وهجر، وكذلك منع أصحابنا الدخول إلى أرض العدو ودخول كنائسهم و البيع، و مجالسة الكفار أهل البدع)، واتە: ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوانە کە دەڵێن: ئیمامەکان وپەیڕەوکەرانیان گشت حوجەت و بەڵگەی خوان ، جا"لەبەر تەقیە"وخۆپاراستن، دەتوانن لەگەڵ پیاو خراپاندا خۆ تێکەڵ بکەن و، گوێ بۆقسەیشیان بگیردرێ ! ئیمامی (تەبەریی) دەڵێ: هەرگیز لەگەڵ ئەوانەدا دامەنیشن گاڵتەوگەپ بەئایەتەکانی خوادەکەن. (ئیبنولعەرەبی) دەڵێ: ئەم ئایەتە بەڵگەی ئەوەیە کەنابێ لەگەڵ ئەهلی (کەبیرە)دا دابنیشین. (ئیبن خوەیزمەنداد) دەڵێ: هەرکەسێك ڕۆچوو لە گاڵتەو مەسخەرە بەئایەتەکانی خوا، دەبێ واز لەخۆیی وکۆڕەکەی بهێنرێ. جابۆ باشتر تێگەیەشتن لەماناو مەبەستی ئەم ئایەتە، سەیرێکی تەفسیری ئایەتی (١٤٠)ی (نیساء) بکە لەم تەفسیرەدا ﴿[٧٠] وذر الذين اتخذوا دينهم لعبا ولهوا﴾ تۆ واز لەوانە بێنە کە ئایینی (فیتریی) خۆیان بە گەمەو گاڵتە گرتووە ﴿وغرتهم الحياة الدنيا﴾ ژیانی ئەم دونیایەش بەتەواوی فریوی داون و، قیامەتیان لەبیرچۆتەوە، ﴿وذكر به﴾ دەسا تۆ بەم قورئانە هەمیشە ئامۆژگاریان بکەو، سزای قیامەتیان وەبیربێنە ﴿ان تبسل نفس بما كسبت﴾ وبابشزانن کە هەرکەسێك بکەوێتە زیندانی بێ دەرەتانی کارو کردەوەی خۆیەوە ﴿ليس لها من دون الله ولى ولا شفيع﴾ وجگە لە خوا هیچ کەس یارمەتی ناداو، هیچ کەسیش تکا بۆ ڕزگاربوونی ناکا ﴿وان تعدل كل عدل لا يؤخذ منها﴾ تەنانەتی هەرچی ماڵی دنیایشی هەیە لە فیدیەو بریتی خۆیدا بیدا، هێمان لێی وەرناگیرێ ﴿اولئك الذين أبسلوا بما كسبوا﴾ ئەمانە لە بەرکارو کردەوەی خراپ و، لەبەربێ باوەڕییان، لە دۆزەخدا بەندەکرێن و، بۆهەمیشەیش گرفتار دەبن ﴿لهم شراب من حميم وعذاب اليم﴾ ئاوی کوڵبەکوڵیان دەدەنێ بوخواردنەوەیان و، سزای بە ئێشیان هەیە ﴿بما كانوا يكفرون﴾ چونکە خوانەناس وبێ باوەڕبوون.

الجزء السابع — سورة الأنعام

وَمَا عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَّقُونَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَىْءٍ وَلَٰكِن
ذِكْرَىٰ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿٦٩﴾ وَذَرِ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟
دِينَهُمْ لَعِبًا وَلَهْوًا وَغَرَّتْهُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا ۚ وَذَكِّرْ بِهِۦٓ
أَن تُبْسَلَ نَفْسٌۢ بِمَا كَسَبَتْ لَيْسَ لَهَا مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِىٌّ
وَلَا شَفِيعٌ وَإِن تَعْدِلْ كُلَّ عَدْلٍ لَّا يُؤْخَذْ مِنْهَآ ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ
ٱلَّذِينَ أُبْسِلُوا۟ بِمَا كَسَبُوا۟ ۖ لَهُمْ شَرَابٌ مِّنْ حَمِيمٍ وَعَذَابٌ
أَلِيمٌۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ ﴿٧٠﴾ قُلْ أَنَدْعُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ
مَا لَا يَنفَعُنَا وَلَا يَضُرُّنَا وَنُرَدُّ عَلَىٰٓ أَعْقَابِنَا بَعْدَ إِذْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ
كَٱلَّذِى ٱسْتَهْوَتْهُ ٱلشَّيَٰطِينُ فِى ٱلْأَرْضِ حَيْرَانَ لَهُۥٓ أَصْحَٰبٌ
يَدْعُونَهُۥٓ إِلَى ٱلْهُدَى ٱئْتِنَا ۗ قُلْ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلْهُدَىٰ ۖ
وَأُمِرْنَا لِنُسْلِمَ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٧١﴾ وَأَنْ أَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ
وَٱتَّقُوهُ ۚ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٧٢﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى
خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ۖ وَيَوْمَ يَقُولُ كُن
فَيَكُونُ ۚ قَوْلُهُ ٱلْحَقُّ ۚ وَلَهُ ٱلْمُلْكُ يَوْمَ يُنفَخُ فِى ٱلصُّورِ ۚ
عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ۚ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْخَبِيرُ ﴿٧٣﴾

١٣٦ وإذ قال

رێنمایەکانی ئایەتی (٦٨-٧٠):

١- لەهەر جێگایەك بێ حورمەتی بەرامبەر بەقورئان ودینی (ئیسلام) بکرێ، مانەوەو دانیشتن لەوجێگایەدا حەرامەو، دەبێ بەپەلە جێ بهێڵرێ، (سەلەف)یش یەك دەنگن کە لەگەڵ ئەهلی (کەبائیر)دا بەتایبەت لەکاتی ئەنجامدانیدا کۆڕو دانیشتن وپەیوەندی ڕەوا نیە.

٢- (فوزەیلی کوڕی عەیاز) ئەڵێ: هەرکەسێ بیدعە چییەکی خۆش ویست، خوا کاروکردەوەی باتڵ دەکاتەوە.

٣- ئەگەر لەبەر لاوازیی و کزیی وبێ دەسەڵاتی ئەوکەسە، یان لەبەر لاوازی گشتیی موسڵمانان نەتوانرا ئەو جێگایە چۆڵبکرێت، ئەوە هەردەبێ یان بەزمان، یان بەدڵ بێزاریی و ئینکاری ئەو کارە دزێوو ناپەسەندەیە بکرێ.

٤- هەرکەسێ بە کوفرەکەیەوە بمرێ، هەرگیز لەئاگری دۆزەخ ڕزگاری نابێ.

**نموونەی مرۆی لەدین وەرگەڕاوە:**

ئیبن کەسیر لە(سەدی)یەوە دەڵێ: کاتێ هاوبەشدانەرەکان بەموسڵمانەکانیان وت: وەرن پەیڕەوی لە ئایین ودینی ئێمە بکەن و، وازبێنن لەموحەممەد ودینەکەی! جابۆ ئەو وەڵامە خوای گەورە ئەم ئایەتەی: (قل أندعوا من دون الله..)ی ناردە خواری و فەرمووی: ﴿[٧١] قل أندعوا من دون الله مالاينفعنا ولايضرنا﴾ پێیان بڵێ: ئاخۆ دەتانەوێ جگە لەخوا هاوار بۆ شتی تر بەرین و بیپەرستین ، کەنەسوودێکمان پێ دەگەیەنن, ئەگەر بیانپەرستین, ونەزیانیشمان پێ دەگەیەنن, ئەگەر نەیانپەرستین ﴿ونرد على أعقابنا﴾ پاشەو پاشیش وەرگەڕێین وپشت لە ئایینی خوا بکەین ﴿بعد إذ هدانا الله﴾ پاش ئەوەی خوای دلۆڤان شارەزای ڕاستەڕێی کردین؟ ﴿كالذى استهوته الشياطين فى الأرض حيران﴾ وەکو کەسێ کەشەیاتینی هەڵیخەڵەتاندبێ و، چەواشەو سەرگەردان بووبێت و لەزەوییدا بسوورێتەوە ﴿له أصحاب يدعونه إلى الهدى ائتنا﴾ ئەوسا هەندێ لە هاوەڵانی خۆی بانگی لێ بکەن و پێی بڵێن: وەرە لای ڕێگای ڕاست و لەگەڵ ئێمەبە، کەچی لەگەڵ ئەوەیشدا، پەیڕەوی هەر لە شەیاتینی بکات! ﴿قل إن هدى الله هو الهدى﴾ بڵێ: ڕێی ڕاست هەرئەوڕێگەیە خوا دیاریکردووە ﴿وأمرنا لنسلم لرب العالمين﴾ وفەرمانیشمان پێدراوە لەلایەن خواوە کە خۆ بدەینە دەستی پەروەردگاری جیهانەکان وتەسلیمی ئەوبین، واتە: ئێوە پاش وەرگەڕان لە ئیسلام- وەکو پیاوێك وانە لەگەڵ چەند هاوڕێیەکدا بە ڕێیەکی ڕاستدا بڕۆن، جا پیاوەکە ڕێ گوم بکا، دەستەیە شەیاتین ڕەفتار بەملاو بەولای ڕێگەدان بانگی لێ بکەن و سەرلێشێواوی بکەن و، هەریەکەیان بیبەن بەلایەکدا ، بەڵام هاوڕێکانی بانگی لێ بکەن وبڵێن وەرە لای ئێمە، ڕێگەکە لێرەوەیە، کەچی ئەو هەر مل بادا، ئەوجا ئێوەش لادانتان لەڕێی ڕاست هەر وەکو ئەوکەسە وایە کە پەیامبەر ﷺ لەسەر ڕێگایەك وەستابێ و بڵێ: لێرەوە وەرە ئەمەیە ڕێگەی ئایینی ئیسلام. کەچی ئەو هەر ڕوو وەربگێڕێ (تەبەری) ﴿[٧٢] وأن أقيموا الصلاة واتقوه﴾ پێمان گوتراوە: کە بەردەوام نوێژ بکەن و لە خوا بترسن و بەهەمیشەیی سنوورەکانی بپارێزن ﴿وهو الذى إليه تحشرون﴾ وە ئەوخوایەیە هەمووتان هەرلای ئەو کۆدەکرێنەوە ﴿[٧٣] وهو الذى خلق السموات والأرض بالحق﴾ هەر ئەویشە کە ئاسمانەکان و زەویی بەڕاست و بەهەق بەدیهێناوە ﴿ويوم يقول كن فيكون﴾ هەر ڕۆژێکیش بفەرموێ: "بەڕۆژی قیامەت" ببە، دەستبەجێ دەبێ ﴿قوله الحق﴾ خوایەکی وایە کە هەر وتەو قسەی ئەو ڕاست و دروستەو، قسە هەرقسەی ئەوە ﴿وله الملك﴾ موڵك و دەسەڵاتیش هەر هی خۆیەتی ﴿يوم ينفخ فى الصور﴾ بەتایبەتی ئەو ڕۆژە کە فوو بە شەیپور"صور"دا دەکرێ ﴿عالم الغيب والشهادة﴾ گشت شتێکی نادیارو دیار دەزانێ ﴿وهو الحكيم الخبير﴾ هەر ئەویشە کار جوان و زاناو ئاگادار بەهەموو شتێك.

## ڕێنمایەکانی ئایەتی (٧١ - ٧٣):

١- پاشگەزبووەوە لەدینی ئیسلام, کارێکی حەرام وقەدەغەیە.

٢- گوێڕایەڵی لە ئەهلی باتڵ و بەقسەکردنیان کارێکی حەرامە.

٣- ئیستا هەر دینی ئیسلام، دینی ڕاستەقینەی خوایەو پێی ڕازییە.

٤- دەبێ دین و شەریعەتی ئیسلام بە هەموو پایەو لقەکانیەوە وەربگیرێ و پیادەبکرێ.

٥- (مەعاد)و زیندووبوونەوە بۆحساب و لێکۆڵینەوە لە گشت کاروکردەوەیەك هەقەو دێت.

## ئیبراهیم ئامۆژگاری بابی دەکا:

الجزء السابع　　سورة الأنعام

۞ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ ءَازَرَ أَتَتَّخِذُ أَصْنَامًا ءَالِهَةً إِنِّيٓ أَرَىٰكَ وَقَوْمَكَ فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٧٤﴾ وَكَذَٰلِكَ نُرِيٓ إِبْرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلْمُوقِنِينَ ﴿٧٥﴾ فَلَمَّا جَنَّ عَلَيْهِ ٱلَّيْلُ رَءَا كَوْكَبًا قَالَ هَٰذَا رَبِّي فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَآ أُحِبُّ ٱلْأٓفِلِينَ ﴿٧٦﴾ فَلَمَّا رَءَا ٱلْقَمَرَ بَازِغًا قَالَ هَٰذَا رَبِّي فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَئِن لَّمْ يَهْدِنِي رَبِّي لَأَكُونَنَّ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٧٧﴾ فَلَمَّا رَءَا ٱلشَّمْسَ بَازِغَةً قَالَ هَٰذَا رَبِّي هَٰذَآ أَكْبَرُ فَلَمَّآ أَفَلَتْ قَالَ يَٰقَوْمِ إِنِّي بَرِيٓءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ﴿٧٨﴾ إِنِّي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ حَنِيفًا وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٧٩﴾ وَحَآجَّهُۥ قَوْمُهُۥ قَالَ أَتُحَٰٓجُّوٓنِّي فِي ٱللَّهِ وَقَدْ هَدَىٰنِ وَلَآ أَخَافُ مَا تُشْرِكُونَ بِهِۦٓ إِلَّآ أَن يَشَآءَ رَبِّي شَيْـًٔا وَسِعَ رَبِّي كُلَّ شَيْءٍ عِلْمًا أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ ﴿٨٠﴾ وَكَيْفَ أَخَافُ مَآ أَشْرَكْتُمْ وَلَا تَخَافُونَ أَنَّكُمْ أَشْرَكْتُم بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ عَلَيْكُمْ سُلْطَٰنًا فَأَيُّ ٱلْفَرِيقَيْنِ أَحَقُّ بِٱلْأَمْنِ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٨١﴾

١٣٧

﴿٧٤ وإذ قال إبرهيم لأبيه آزر﴾ ئەوکاتە وەبیربێنە کە (ئیبراهیم) ئامۆژگاری (ئازەر)ی باوکی دەکردو پێیگوت: ﴿أتتخذ اصناما آلهة﴾ ئەرێ تۆ بتگەلێك چۆن بەخوا دەگری ودەیانپەرستی ؟! ﴿إني اراك وقومك في ضلال مبين﴾ بێگومان من دەبینم هەم خۆت و، هەم نەتەوەوخزمەکانەت لەڕێ لاتان داوەو بەئاشکرا سەرلێشێواون ﴿٧٥ وكذلك نري إبراهيم ملكوت السموات والأرض﴾ هەر ئاوا مەلەکوت و دەسەلاتی فراوان وبێ سنووری خۆمان نیشانی ئیبراهیم دەدەین لە ئاسمانەکان و زەوییدا (قورتوبی) ئەڵێ: (ملكوت: أي ملك، وزيدت الواو والتاء للمبالغة في الصفة مثل: الجبروت). هەندێ لە زاناکان ئەڵێن: ئەودەمە خوا ئەودەسەلات ومەلەکووتەی نیشانی ئیبراهیم دا لە ئاسمان وزەمییدا، تەمەنی (١٥-١٧)ساڵ بوو ﴿وليكون من الموقنين﴾ هەتا لە جەرگەی ئەوانەدابێ یەقینی تەواویان بە بوون ویەکتاکی پەروەردگاریان هەیە ﴿٧٦ فلما جن عليه الليل﴾ جا کە شەو بەسەرهات و تاریکایی شەو دنیای داپۆشی ﴿رأى كوكبا﴾ سەیرێکی ئاسمانی کردو ئەستێرەیەکی ڕووناکداری بەدی کرد ﴿قال هذا ربي﴾ وتی: ببێ و نەبێ ئەمە پەروەردگارمە. جا لەبەرئەوە ئەوکات گەلەکەی بت و خۆرو مانگ و ئەستێرەیان دەپەرست، ئەمیش نەرم نەرمێ بۆیان چووو هەمووشیانی پووچەڵ کردەوە ﴿فلما افل قال لا احب الآفلين﴾ جا هەرکە لەچاو ئاوا بوو ونەما، وتی: من هیچ شتێکی ئاوا بووم خۆش ناوێ ﴿٧٧ فلما رأى القمر بازغا﴾کە دیتیشی مانگ هەڵات ﴿قال هذا ربي﴾ وتی:ئەمەیە پەروەردگارم ﴿فلما افل قال لئن لم يهدني ربي﴾ جاهەر کە ئەمیش ئاوا بووو نەما وتی: بێگومانم کە ئەگەر پەروەردگارم هیدایەتم نەدات ﴿لأكونن من القوم الضالين﴾ منیش لەوخەڵکە گومڕاو سەرلێشێواو دەبم ﴿فلما رأى الشمس بازغة﴾ ئەوجا هەرکە خۆری دیت هەڵهات ﴿قال هذا ربي﴾ گوتی: ئەمەیانە پەروەردگارم ﴿هذا اكبر﴾ ئەمە لەمانگ و ئەستێرەکانی تر گەورەترە ﴿فلما افلت﴾ جا کە ئەمیش ئاوا بووو لەچاو ونبوو ﴿قال يا قوم إني بريئ مما تشركون﴾ وتی گەلەکەم! بە

ڕاستیی من لەو بتانەی ئێوە ئەیانکەنە هاوبەشی خوا تەکیمەوەو بێزارم ﴿ ٧٩ إنی وجهت وجهی للذی فطر السموات والأرض﴾ دڵنیابن وامن ڕوومکردە ڕووی پیرۆزی ئەوزاتە کە ئاسمانەکان و زەویی بێ بنەما بەدی هێناوە ﴿حنیفا﴾ لە هەمووشیرك وکارێکی پڕو پووچ و بەتاڵیش لامداو، ڕووم تەنها لەزاتی پاکی بێخەوشی ئەو کرد ﴿وماأنا من المشرکین﴾ وە لەوکەسانەش نیم هاوبەشی بۆ دادەنێن.

## ڕێنمایەکانی ئایەتی (٧٤ - ٧٩):

دەبێ بێزاری وحاشا لەهەموو جۆرە شیرك و، لەهەرکارێکی خراپ دەربڕێت، گەرچی بەرامبەر بەکەس وکارو خزمانیش بێ، هەروەکو (ئیبراهیم) ﷺ ئینکاریی ونکووڵی لەگەڵ باب و خزمانی خۆیدا کرد، شیاوی ئاماژە بۆ کردنە گەل و هۆزەکەی ئیبراهیم (صابئە) و ئەستێرە پەرستبوون .

### شیرك لە هەموو شتێ گەورەترە:

﴿ ٨٠ وحاجە قومە﴾ هەرکە ئیبراهیم لەبتەکان دوورکەوتەوە، ئیتر هۆزوو گەلەکەی کەوتنە شەڕە قسە و دەمەقاڵێ لە گەڵیا ﴿قال اتحاجونی فی الله وقد هدان﴾ ئەویش وتی: ئایا ئێوە سەبارەت بەبوون وتاك وتەنیایی خوا قرە قرو دەمبازیم لەگەڵ ئەکەن، کە من خوا خۆی بە چەندین بەڵگەی ڕوون و ئاشکرا شارەزاو ڕێنمایی کردووم ﴿ولا اخاف ماتشرکون بە﴾ لەو بتانەش ناترسم ئێوە دەیانکەنە هاوەڵ و شەریکی خوا ﴿إلا أن یشاء ربی شیئا﴾ بەڵام پەروەردگارم خۆی حەزبکا، تووشی بەڵاوشتێکم دەکا، ئەگینا هەرگیز بەدەستی ئەوانە تووشی هیچ شتێ نابم ﴿وسع ربی کل شئ علما﴾ خۆ پەروەردگاریشم ئاگای لە هەموو شتێکە ﴿افلا تتذکرون﴾ دەسا ئێوە بیرناکەنەوە لەوکارە هەڵانە دەیانکەن؟! ﴿ ٨١ وکیف أخاف ما أشرکتم﴾ من چۆن لەودارو بەردە دەترسم ئێوە کردووتانن بە هاوبەش و شەریکی خوا ﴿ولا تخافون انکم اشرکتم بالله﴾ بەڵام ئێوە ناترسن لەوە شەریك و هاوبەشتان بۆخوا داناوە ؟! ﴿ما لم ینزل بە علیکم سلطانا﴾ بەمەرجێ خوا هیچ بەڵگەو نیشانەیەکی بۆپشتگیری ئەوانە نەناردۆتە خوارەوە، واتە: بێ زانست و بەڵگە هەر لەخۆتانەوە بتان دەپەرستن ﴿فأی الفریقین احق بالأمن﴾ ئاخۆ کام دەستەمان (ئێمە، یان ئێوە) هەقدارترین بە ئاسایش وئەمن لەڕۆژیقیامەتدا ؟ ﴿إن کنتم تعلمون﴾ ئەگەر ئێوە خاوەن زانست و زانیاریی بن ، ئەمە لێکدەنەوە ﴿ ٨٢ الذین آمنوا ولم یلبسوا إیمانهم بظلم﴾ ئەو کەسانەی بڕوایان هێناو، لەهەمان کاتدا ناحەقیی و شیرکیان تێکەڵ بە ئیمانەکەیان نەکرد ﴿أولئك لهم الامن﴾ ئاسایش ونەبوونی ترس لەسزای خوا هەربۆ ئەوانە، نەك بۆ بت پەرستەکان ﴿وهم مهتدون﴾ وهەر ئەوانیشن ڕێنمایی کراو بۆ ڕێگەی ڕاست و، بەهەقیانەتیش لەسەرینی. پێشەوا(ئەحمەد) دەگێڕێتەوەو دەڵێ: کاتێ ئەم ئایەتی: (الذین آمنوا ولم یلبسوا إیمانهم بظلم ..) هاتە خوارێ، هاوەڵان زۆرپێیان سەخڵەتبوو و گوتیان: ئاخۆ کەسێك هەبێ ستەمی نەکردبێ لەخۆی ؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: مەبەست بەو (ستەم)ە لە ئایەتەکەدایە (شیرك)ە، واتە: دانانی شەریکە بۆ خوا، مەگەر ئەو ئایەتانەتان نەخوێندۆتەوە کە (لوقمان) بە کوڕەکەی خۆیگوت: (یا بنی لا تشرك بالله إن الشرك لظلم عظیم).

## ڕێنمایەکانی ئایەتی (٨٠-٨٣):

١- (مونازەرە) وگفتوگۆ ڕووبەڕووی باتڵ بێژان و موشریکان، بەمەبەستی ڕوونکردنەوەی هەق و دەرخستنی ڕاستییەکان ، بەشکو بێنە سەر ڕێی ڕاست وهیدایەت ببن، کارێکی پێویست وڕێپێدراوە لە ئیسلامدا.

٢-دەستەو بەستەی موشریکان وخوانەناسان، لە هەمووکاتدا عەقڵیەتێکی سەیرو سەمەرەوداخراویان هەیە.

٣- ئەوکەسەش شیاوبێت بەئەمنیەتی خواو، لەسزایشی ترسی نەبێت، هەرئەوەیە کە هاوبەش و شەریکی بۆ دانەنێ.

﴿[٨٣] وتلك حجتنا آتيناها إبراهيم على قومه﴾ ئەمە چەند بەڵگەیەك بوون نیشانی ئیراهیمان داو سەرمان خست بە سەر گەلە بت پەرستەکەیدا ﴿نرفع درجات من نشاء﴾ کێیشمان ئارەزووبێ وەکو ئیبراهیم ﷵ پلەوپایەی بەرز دەکەینەوەو سەری دەخەین بەسەرگەلەکەیدا ﴿إن ربك حكيم عليم﴾ بێگومانە کە پەروەردگارت زۆر کارجوان و، زۆریش زانایە, خۆی چاك دەزانێ چی بکات.

**ئیسحاق و یاقووب هەردوو بە ( پیری ) درانە ئیبراهیم ( علیهم السلام ):**

سُورَةُ الأَنعَام — الجُزءُ السَّابِع

ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمْ يَلْبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلْمٍ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلْأَمْنُ
وَهُم مُّهْتَدُونَ ﴿٨٢﴾ وَتِلْكَ حُجَّتُنَآ ءَاتَيْنَٰهَآ إِبْرَٰهِيمَ عَلَىٰ
قَوْمِهِۦ نَرْفَعُ دَرَجَٰتٍ مَّن نَّشَآءُ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٌ ﴿٨٣﴾
وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ كُلًّا هَدَيْنَا وَنُوحًا
هَدَيْنَا مِن قَبْلُ وَمِن ذُرِّيَّتِهِۦ دَاوُۥدَ وَسُلَيْمَٰنَ وَأَيُّوبَ
وَيُوسُفَ وَمُوسَىٰ وَهَٰرُونَ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٨٤﴾
وَزَكَرِيَّا وَيَحْيَىٰ وَعِيسَىٰ وَإِلْيَاسَ كُلٌّ مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٨٥﴾
وَإِسْمَٰعِيلَ وَٱلْيَسَعَ وَيُونُسَ وَلُوطًا وَكُلًّا فَضَّلْنَا عَلَى
ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٦﴾ وَمِنْ ءَابَآئِهِمْ وَذُرِّيَّٰتِهِمْ وَإِخْوَٰنِهِمْ وَٱجْتَبَيْنَٰهُمْ
وَهَدَيْنَٰهُمْ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٨٧﴾ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهْدِى
بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَلَوْ أَشْرَكُواْ لَحَبِطَ عَنْهُم مَّا كَانُواْ
يَعْمَلُونَ ﴿٨٨﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ
فَإِن يَكْفُرْ بِهَا هَٰٓؤُلَآءِ فَقَدْ وَكَّلْنَا بِهَا قَوْمًا لَّيْسُواْ بِهَا بِكَٰفِرِينَ
﴿٨٩﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقْتَدِهْ قُل لَّآ
أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرَىٰ لِلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٠﴾

وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ — ١٣٨

﴿[٨٤] ووهبنا له إسحاق ويعقوب﴾ ئیبراهیش پاش ئەوەهیوای منالی نەمابوو، ئیسحاق و یەعقوبمان پێبەخشی و بە پەیامبەرێتی شەرەفمەند بوون وەکو ئەفەرموێ: ﴿كلا هدينا﴾ هەمووشیانمان رێنمایی رێی ڕاست کردوبوونەپەیغەمبەر ﴿ونوحا هدينا من قبل﴾ بەر لە ئیبراهیمیش نووحمان رێنمایی کردو بوویە پێغەمبەر ﴿ومن ذريته داود وسليمان﴾ لە ناو زاڕۆڵەو نەوەکانی ئیبرهیمشدا داودو سولەیمان ﴿وايوب ويوسف وموسى وهارون﴾ و ئەیوب و یوسف و موساو هارون یشمان شارەزاکردن وبوونە پێغەمبەر ﴿وكذلك نجزي المحسنين﴾ ئێمە هەر ئاوا پاداشی چاکە کاران دەدەینەوە ﴿[٨٥] وزكريا ويحيى وعيسى وإلياس﴾ زەکەریاو یەحیاو عیساو ئیلیاسیشمان شارەزاو رێنماکردو بوونە پەیغەمبەر، بۆیە دەفەرموێ: ﴿كل من الصالحين﴾ هەمووشیان لەپیاو خاسانی خوابوون ﴿[٨٦] وإسماعيل واليسع ويونس و لوطا﴾ ئیسماعیل و ئەلیەسەع و یونس و لووطیش هەروەها ﴿وكلا فضلنا على العالمين﴾ وە هەمووشیانمان زیاتر لەگشت خەڵکی سەرزەویی رێزو قەدر لێنان ﴿[٨٧] ومن ابائهم وذرياتهم وإخوانهم﴾ ولە باوو باپیران و نەوەکانیان و براکانیاندا کۆمەڵێکی زۆرمان لێ رێنمایی کردن ﴿و اجتبيناهم وهديناهم إلى صراط مستقيم﴾و برێکیانمان هەڵبژاردن بۆپێغەمبەرێتی و، شارەزای ڕێی ڕاست و دروستمان کردن ﴿[٨٨] ذلك هدى الله﴾ ئەوەیە رێی راستی خواو، رێنمایش هەربەدەستی خۆیەتی ﴿يهدي من يشاء من عباده﴾ لە بەندەکانی خۆی کێ حەزلێ بکا، شارەزاو رێنمایی گشت کارێکی خێری دەکات ﴿ولو أشركوا﴾ لەگەڵ ئەوەیشدا ئەگەر ئەو پەیامبەرانە ﷷ هاوبەشیان بۆخوا دانابا ﴿لحبط عنهم ما كانوا يعملون﴾ هەمووکارەکانیان سەرجەم پووچەڵ دەبوویەوە, باشە دەبێ حاڵی خەڵکانی تر چۆن بێت, ئەگەر هاوبەش وشەریك بۆخوا دابنێن؟ ﴿[٨٩] اولئك الذين آتيناهم الكتاب والحكم والنبوة﴾ ئەوانەبوون ئێمە کتێب و نامەو تێگەیشتن و پەیامبەرێتیمان پێدان ﴿فإن يكفر بها هؤلاء﴾ ئینجا ئەگەر ئەمانەی سەردەمی تۆ ئەی موحەممەد!

کافروبێ بڕوابن بەپەیغەمبەرێتی ئەوانەو،بە ئایەتەکانمان ﴿فقد وكلنا بها قوما﴾ بەڕاستیی ئەوکارە دەدەینە دەستی تاقم و گەڵێکی تر، وەکو(ئەنصاروموهاجر) ﴿ليسوا بها بكافرين﴾ ئەوان کافرو بێ بڕوا نابن پێیان و دەشیان پارێزن وتەسلیمیان دەبن ﴿[٩٠] أولئك الذين هدى الله﴾ ئەوپێغەمبەرو نەوەوشوێنکەوتوانەیان بوون ، خوا بۆخۆی شارەزاو ڕێنوێنی کردن و، بەهەق ڕێگایان گرت ﴿فبهداهم اقتده﴾ سا تۆیش ئەی موحەممەد ﷺ هەر لەشوێن ئەوانەوە بچۆ و، چاولە سیفەتەکانی ئەوان بکە ﴿قل لا اسئلكم عليه أجرا﴾ پێیان بڵێ: لەبەرامبەر گەیاندنی بەرنامەکەی خواوە ،داوای هیچ مزەو کرێیەکتان لێ ناکەم ﴿إن هو إلا ذكرى للعالمين﴾ ئەم (قورئانەیش) تەنها پەندو ئامۆژگارییەکە بۆ هەموو خەڵکانی جیهان. بەڵێ ڕاستە, قورئان بۆ ئەوانەی گوێی بۆ دەگرن و، دڵیان وشیارە, پەندوو ئامۆژگاریەو، قازانج و خێری لێ دەبینن.



وَمَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ إِذْ قَالُوا۟ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ بَشَرٍ مِّن شَىْءٍ
قُلْ مَنْ أَنزَلَ ٱلْكِتَٰبَ ٱلَّذِى جَآءَ بِهِۦ مُوسَىٰ نُورًا وَهُدًى لِّلنَّاسِ
تَجْعَلُونَهُۥ قَرَاطِيسَ تُبْدُونَهَا وَتُخْفُونَ كَثِيرًا ۖ وَعُلِّمْتُم مَّا لَمْ تَعْلَمُوٓا۟
أَنتُمْ وَلَآ ءَابَآؤُكُمْ ۖ قُلِ ٱللَّهُ ۖ ثُمَّ ذَرْهُمْ فِى خَوْضِهِمْ يَلْعَبُونَ ﴿٩١﴾
وَهَٰذَا كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ مُبَارَكٌ مُّصَدِّقُ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ وَلِتُنذِرَ
أُمَّ ٱلْقُرَىٰ وَمَنْ حَوْلَهَا ۚ وَٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ۖ
وَهُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ ﴿٩٢﴾ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى
ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ قَالَ أُوحِىَ إِلَىَّ وَلَمْ يُوحَ إِلَيْهِ شَىْءٌ وَمَن قَالَ سَأُنزِلُ
مِثْلَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ۗ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِى غَمَرَٰتِ ٱلْمَوْتِ
وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ بَاسِطُوٓا۟ أَيْدِيهِمْ أَخْرِجُوٓا۟ أَنفُسَكُمُ ۖ ٱلْيَوْمَ
تُجْزَوْنَ عَذَابَ ٱلْهُونِ بِمَا كُنتُمْ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ غَيْرَ ٱلْحَقِّ
وَكُنتُمْ عَنْ ءَايَٰتِهِۦ تَسْتَكْبِرُونَ ﴿٩٣﴾ وَلَقَدْ جِئْتُمُونَا فُرَٰدَىٰ
كَمَا خَلَقْنَٰكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَتَرَكْتُم مَّا خَوَّلْنَٰكُمْ وَرَآءَ ظُهُورِكُمْ ۖ
وَمَا نَرَىٰ مَعَكُمْ شُفَعَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُمْ أَنَّهُمْ فِيكُمْ شُرَكَٰٓؤُا۟ ۚ
لَقَد تَّقَطَّعَ بَيْنَكُمْ وَضَلَّ عَنكُم مَّا كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴿٩٤﴾



**پێغەمبەر ئادەمییەو بەرنامەیشی بۆ هاتووە:**

(ئیبن عەبباس) و(موجاهید) دەڵێن: ئایەتی (وما قدروا الله حق قدره..) لەبارەی قورەیشەوە هاتە خوارێ، ئیمامی (تەبەریی)ش هەر ئەوقسەیەی پەسەندکردووە. هەندێکیش دەڵـێن: سـەبارەت بـە جوولەکـەکان هـات. ئێمـەیش لـەم تەفسیرە کورتـەدا لـە سـەر ڕاو بـۆ چوونی دەستەی دوایی مانامان لێدایەوە، چونکە دەقی قورئانەکەش پشتگیری لەوە دەکا، خوایش باشتر دەزانێ. ﴿[٩١] وما قدرواالله حق قدره﴾ کەچـی (جوولەکـە)وەك پێویسـت ڕێزیـان لـەخوا نـەگرت ونەیانناسی ﴿إذ قالوا ما انزل الله على بشر من شئ﴾ کاتێ گوتیـان: خـوا هـیچ نامـەو وەحیێکـی بـۆ هـیچ ئادەمییـەك نەناردووە! دیارە ئەم عینادیی و ئێرەییەیان ، تەنیا لە ڕقی قورئاندایە, بۆیە ئینکاری هەموو وەحیی و سروشێك دەکەن بە (تەورات)ەکەی خۆشیانەوە !! ﴿قل من انزل الكتاب الذى جاء به موسى﴾ پێیان بڵێ: باشە! ئەو نامەی (تـەورات)ـە مووسا هێنای کێ دایبەزاند ﴿نورا وهدى للناس﴾ کەبوویە ڕووناکیی و، ڕێنمایی بۆ مەردم؟ ﴿تجعلونه قراطيس﴾ کە ئێوە ئێستا لەنوسخە ڕەسەنەکەی پەڕە پەڕەی دەکەن ﴿تبدونها وتخفون كثيرا﴾ بەشێکی کەمی کە بەقازانجتان بێ بۆ خەڵکی دەردەخەن و، باسی دەکەن و، زۆرێکیشی کە بەزیانی خۆتانی بزانن ئەیشارنەوە، وەك ئەو پەسن و صیفەتە جوانانەی سەبارەت بەپەیامبەر ﷺ لە تەوراتدا هاتوون ﴿و علمتم مالم تعلموا انتم ولا آباؤكم﴾ باشە ئەگەر خوا هیچ نامەیەکی نەناردووە! ئەو هەوالأنە کە لەم قورئانەدا بەئێوە ڕاگەیەنرا کەنە خۆتان و، نە باوباپیرانتان دەتانزانین کێ فێری کردن؟ ﴿قل الله﴾ دەسا بڵێ: هەر خوای گەورەبوو ئەو قورئانەی نارد ﴿ثم ذرهم فى خوضهم يلعبون﴾ ئیتر وازیان لێ بێنە باهەر بەقسەی نابەجێی خۆیانەوە سەرقاڵبن وگاڵتەو مەسخەرە بکەن، ئەوسا چاك دەزانن" ﴿[٩٢] وهذا كتاب انزلناه مبارك﴾ ئەم قورئانەش بۆمان دابەزاندوویت نامەیەکی پیرۆزەو, مایەی بەختەوەری هەمووخەڵکانە بە مەرجێ پەیڕەوی لێ بکەن ﴿مصدق

﴿الذی بین یدیه﴾ بەراست دانەری ئەو کتێبانەشە لەپێشیەوەبوون وەکو(تەورات و ئینجیل و..) ﴿ولتنذر به أم القری ومن حولها﴾ دامان بەزاند هەتا تۆ ئەی پێغەمبەرﷺ خەڵکانی شاری مەککە و، ئاواییەکانی دەوروبەری مەککەی پێ بترسێنی ﴿والذین یؤمنون بالآخرة﴾جا ئەو کەسانەی بڕوایان بە ڕۆژی دوایی هەبێ ﴿یؤمنون به﴾ ئەوا بڕوایش بەم قورئانە دەکەن ﴿وهم علی صلاتهم یحافظون﴾ بەردەوامیش هۆشیارن بە نوێژەکانیانەوەیە و، چاودێریی و پارێزگاریان دەکەن و، لەکاتی خۆیاندا بەچاکی و پاکی ئەنجامیان دەدەن .

**ئەوی بڵێ: ( وەحیی )م بۆ هاتووە، لێی ستەمکارتر نیە :**

﴿[٩٣] ومن أظلم ممن افتری علی الله کذبا﴾ دەبێ چ کەسێك لەوە ستەمکار تربێ کە لە سەر خوا درۆ هەڵبەستێ وبڵێ: خوا هیچ شتێکی بەوەحی نەناردوّتە خواریّ، نەتەورات، نەقورئان!! ﴿او قال اوحی إلی﴾ یان بڵێت: من لە لای خواوە وەحی و سروشم بۆ کراوە وەکو (موسەیلەمەی ئەسوەدی عەنسی) کەبێشەرمانە داوای پێغەمبەرێتی دەکرد! ﴿ولم یوح إلیه شئ﴾ لەراستیشدا هیچ شتێکی بۆ وەحی نەکراوە ﴿ومن قال سأنزل مثل ما انزل الله﴾ وەیان بڵێ: منیش دەتوانم وەکو ئەو کتێبانە بنێرم، خوا ناردونی؟ ﴿ولو تری إذ الظالمون فی غمرات الموت﴾ وئەگەر لەوکاتەدا کە ستەمکاران لە نارەحەتی و پەلەقاژەی مەرگدان ببینی چۆن گرفتاربوون ﴿والملائکة باسطوا أیدیهم﴾ فریشتەی گیانکێشانیش دەستیان لێدەکەنەوەو لێیان دەدەن ﴿اخرجوا انفسکم﴾ و پێیان دەڵێن: دەگیانی خۆتان لەجەستەتان دەربهێنن وبینێرنە لای قارو تورەیی خوای گەورە، دیارە ئەوانیش بۆیان دەرنایەو، فریشتەکانیش لەپشتەوە تێیان دەسرەوێنن ﴿الیوم تجزون عذاب الهون﴾ پێشیان دەڵێن: وا ئەمڕۆش بەئەوپەڕی سەرشۆریی و ریسواییەوە جەزرەبەو تۆڵە دەدرێن ﴿بما کنتم تقولون علی الله غیر الحق﴾ چونکە لە دنیادا لەسەرخوا درۆتان هەڵدەبەست و قسەی نابەجێتان دەکرد ﴿وکنتم عن آیاته تستکبرون﴾ ولەبەرامبەر ئایەتەکانیشیەوە خۆتان بەزل دەزانی ﴿[٩٤] ولقد جئتمونا فرادی﴾ لە ڕۆژی دواییدا خوا بە بێ باوەڕەکان ئەفەرموێ: وائەمڕۆ بێ ماڵ و حاڵ و رووت و قووت وتاك و تەنیا بێ سۆ هاتنەوە لامان ﴿کما خلقنا کم أول مرة﴾ هەروەك چۆن لەسەرەتاوە بێ ماڵ و حاڵ ورووت وقووت دروستمان کردن ﴿وترکتم ما خولناکم وراء ظهورکم﴾ وهەرچیشمان پێدابوون لەماڵ وسامانی دنیا، لەدوای خۆتان گشتتان جێهێشت ﴿ومانری شفعاءکم الذین زعمتم أنهم فیکم شفعاء﴾ ئەوانەیش نابینین بەهاناتانەوە بێن کەپێتان وابوو شەریك وهاوبەشی خوان، هەتا تکاو شەفاعەتتان بکەن ﴿لقد تقطع بینکم﴾ ئەوا هەرچی ئەسباب وهۆی پەیوەندی نێوانتان بوو بچڕاو نەما ﴿وضل عنکم ما کنتم تزعمون﴾ ئەو شتانەش ئێوە بە خەیاڵ واتان دەزانی تکاتان بۆ ئەکەن، هەموو تیاچوون و بەهیچ دەرچوون.

**بەم بەڵگانە باش خوا بناسە :**

﴿[٩٥] إن الله فالق الحب والنوی﴾ بێگومان هەرخوایە دانەودەنك وناوکەی جۆراوجۆری دانەوێڵە لە ژێر زەوییدا دەقلیشێنێ، واتە: هەردەسەڵات وتوانایی ئەوە کە ناوك لەت دەکا وکشت وکاڵی لێدەڕوێنێ و، درەختی لێ سەوز دەکا ﴿یخرج الحی من المیت﴾ زیندوویش لەمردوو دەردێنێ، گیا لەدانەوێڵەی وشك دەڕوێنێ ﴿ومخرج المیت من الحی﴾ و دەرهێنەری مردوویشە لە زیندوو ﴿ذلکم الله فأنی تؤفکون﴾ ئەوە ئەوکارانە دەکاخوای پەروەردگارتانە، دەسائێوە لە بڕواهێنان چۆن کلا دەبن و لا ئەدرێن؟ ﴿[٩٦] فالق الإصباح﴾ هەرخۆشیەتی تاریکایی شەوگار لادەداو، سپێدەی بەرەبەیان دێنێ و دونیا رووناك دەکاتەوە" ﴿وجعل اللیل سکنا﴾ و شەویشی بۆ ئیسراحەت و پشوودان دانا، هەمووشتێك تیایا ئارام ئەگرێ ﴿والشمس والقمر حسبانا﴾ و خۆرو مانگیشی بە ئەندازەو حسێبێکی ورد

راگرتـووەو، هەریەکـەیان لەخولگـەی خۆیـدا زۆر بـە وردی دێـن ودەچـن ﴿ذلـك تقـدير العزيـز العليـم﴾ ئـەوەش
ئەندازەگیری خـوای خـاوەن دەسەڵات و زانایـە ﴿(٩٧) وهو الذى جعل لكم النجوم﴾ هـەر ئەویشـە کـە ئەستێرەکانی
کردووە بەنیشانە بۆ ئێوە ﴿لتهتدوا بها فى ظلمات البر والبحر﴾ تا لەتاریکیـەکانی وشکانیی ودەریاو زەریاکاندا
ڕێیان پێ دەرکەن ﴿قد فصلنا الآيات لقوم يعلمون﴾ بەڕاستیی ئێمـە نیشانەکانی خۆمان بۆ خـەڵکانێکی زاناو ژیر
ڕۆشن دەکەینەوە ﴿(٩٨) وهو الذى انشاكم من نفس واحدة﴾ هەر ئەویشە کەهەموو ئێوەی لە تـەنیا کەسێك (ئادەم)ی
بابتان بنەڕەت دانا ﴿فمستقر ومستودع﴾ ئەوسا لەمناڵدانی دایکتاناو، لەپشت بابتانا مەحکەم دایمەزراندن ﴿قد
فصـلنا الآيـات لقـوم يفقهـون﴾ بەڕاستیی ئێمـە نیشـانەکانی خۆمـان بۆخـەڵکانێك کـە لـە ڕاستییەکان تێبگـەن،
ڕووندەکەینەوە ﴿(٩٩) وهو الذى أنزل من السماء ماء﴾ هەرئەو
دەسـەڵاتدارەیە کـە لەهەورەکانـەوە بەئەنـدازەی پێویسـت
دەباراند ﴿فأخرجنابه نبات كل شئ﴾ ئینجا هـەموو جۆرە
ڕووەکێکمان لێ دەرهێنا ﴿فأخرجنا منه خضرا﴾ ئەوساش
هەرلـەوە، سـەوزەگیاو گـوڵ و گـوڵزارو شـینایی لێدەڕوێنین
﴿نخرج بـه حبا متراكبا﴾ لـەویش چـەندین دەنکـە کەڵەکـە
کردووی لەسەر یـەکی لێ پەیدا دەکـەین , وەکو گوڵـە گـەنم و
جۆ و مەرەزەو.. هتد ﴿ومن النخل من طلعها قنوان دانية﴾
وە لەگوڵی دارخورمایش هێشووی چڕو پڕوو شۆڕەوە بوو
فەراهـەم دێـنین ﴿وجنـات مـن أعنـاب والزيتـون والرمـان
متشـابها وغير متشـابه﴾ وە چـەن باخێـك لـە ڕەزو لـە داری
زەیتـوون و لـە بنـە هـەناری هـاو وێنـەو لەیەکچوو لـە گـەڵادا,
جیاوازولە یەك نەچوو لە تامدا, بەرهەممان هێنا ﴿انظروا إلى
ثمره إذا اثمر و ينعه﴾ دەسا وەختێ وەبەردێن و میوەیان
پێدەگا، جوان تەماشای بەرهەمی هەریەکەیان بکەن و بزانن
ئەو هەموو ئاڵ و گۆڕە کێ دەیکا؟ ﴿إن فى ذلكم لآيات لقوم
يؤمنون﴾ بەڕاستیی لەوچەند شتانەدا گەلێ نیشانەی گەورەو
مـەزن هـەن بـۆ گـەلێك بیـەوێ بـاوەڕ بـەخوا بکـا ﴿(١٠٠) وجعلـوا لله شـركاء الجـن﴾ چـەندە مایـەی سەرسوڕمانە کـە
موشریکەکان ئەو جنۆکانەیان کردە هاوبەشی خوا!! لەباتی ئەوەی کە تەنها خوا بپەرستن. ﴿وخلقهم﴾ خۆ دەشزانن
کە تەنها خوا بۆ خۆی دروستیکردوون ﴿وخرقوا لـه بنين وبنات بغير علم﴾ وە هـەر بە نەزانی خۆیـان و، بەدرۆ و
دەلەسە کوڕو کچیان دایە پاڵی خوا، واتە: گوتیان: (عوزەیر) کوڕی خوایەو، فریشتـەیش کچیەتی ﴿سبحانه وتعالى
عما يصفون﴾ خۆ خواش زۆر پاك و بێ عـەیب و بـەرزو بڵند و بێخەوشە لەوشتانە ئەوان دەیدەنە پاڵی ﴿(١٠١) بديع
السموات والأرض﴾ بە دیهێنەری ئاسمانەکان و زەوییە، بێ ئەوە لەسەرەتاوە نەخشەیەکیان بووبێ ﴿انى يكون له
ولد ولم تكن لـه صاحبة﴾ باشە خوایـەکی بـێ نیـازی وا چـۆن نەتـەوەو منداڵی هەیـە، کـە ئـەو لـە بنەڕەتدا ژن
وهاوسەری نەبێت؟ ﴿وخلق كل شئ﴾ هەموو شتێکیش بە بتەکانی ئەوانیشەوە هەرخۆی دروستیکردووە ﴿وهو



الحزب ١٤

إِنَّ ٱللَّهَ فَالِقُ ٱلْحَبِّ وَٱلنَّوَىٰ يُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَمُخْرِجُ
ٱلْمَيِّتِ مِنَ ٱلْحَىِّ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ (٩٥) فَالِقُ ٱلْإِصْبَاحِ
وَجَعَلَ ٱلَّيْلَ سَكَنًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ حُسْبَانًا ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ
ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ (٩٦) وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلنُّجُومَ لِتَهْتَدُوا۟
بِهَا فِى ظُلُمَٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ قَدْ فَصَّلْنَا ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ
(٩٧) وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ فَمُسْتَقَرٌّ وَمُسْتَوْدَعٌ
قَدْ فَصَّلْنَا ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَفْقَهُونَ (٩٨) وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ
مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ نَبَاتَ كُلِّ شَىْءٍ فَأَخْرَجْنَا مِنْهُ
خَضِرًا نُّخْرِجُ مِنْهُ حَبًّا مُّتَرَاكِبًا وَمِنَ ٱلنَّخْلِ مِن طَلْعِهَا
قِنْوَانٌ دَانِيَةٌ وَجَنَّٰتٍ مِّنْ أَعْنَابٍ وَٱلزَّيْتُونَ وَٱلرُّمَّانَ مُشْتَبِهًا
وَغَيْرَ مُتَشَٰبِهٍ ٱنظُرُوٓا۟ إِلَىٰ ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثْمَرَ وَيَنْعِهِۦٓ إِنَّ فِى ذَٰلِكُمْ
لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ (٩٩) وَجَعَلُوا۟ لِلَّهِ شُرَكَآءَ ٱلْجِنَّ وَخَلَقَهُمْ
وَخَرَقُوا۟ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَٰتٍۭ بِغَيْرِ عِلْمٍ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا
يَصِفُونَ (١٠٠) بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُۥ وَلَدٌ
وَلَمْ تَكُن لَّهُۥ صَٰحِبَةٌ وَخَلَقَ كُلَّ شَىْءٍ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ (١٠١)

بكل شئ عليم﴾ و بە هەموو شتێكیش زۆر زاناو بە ئاگایە ﴿١٠٢ ذلكم الله ربكم لا إله إلا هو﴾ هەر ئەو خوایەیە پەروەردگاری ئێوە، ئیترجگە لە و هیچ پەستراوێكی تر نیە بۆ پەرستن بشێ ﴿خالق كل شئ فاعبدوه﴾ دروستكەری هەموو شتێكیشە، دەسا ئێوەش بەشێوەیەكی شیاو بیپەرستن ﴿وهو على كل شئ وكيل﴾ هەرئەویشە پارێزەر و چاودێری هەموو شتێك .

## خوا بە چاو دەركناكرێ و نابینرێ:

﴿١٠٣ لا تدركه الأبصار﴾ هیچ چاوێك دەركی ناكاو بۆی نابینرێ ﴿و هو يدرك الأبصار﴾ لە كاتێكدا ئەو هەموو چاوەكان دەرك دەكاو دەبینێ و بە وردیش ئاگای لەهەموو شتێكە ﴿و هو اللطيف الخبير﴾ تەنها ئەویشە كارناسك و وردبین و ئاگادار بە هەموو شتێك. (سەلەفی صالح) لەم دیتن و نەدیتنەی خوای گەورەیەدا چەندتێبینی وقسەیەكیان هەیە: یەكێ دەڵێ: لە دونیادا هەرگیز خوا بۆهیچ كەسێك نابینرێو دەركناكرێ، ئەگەرچی لەقیامەتیشدا ببینرێ، بۆیە خاتوو (عائیشە/خوا لێی رازی بێت) دەڵێ: (من زعم أن محمدا أبصر ربه فقد كذب على الله، فإن الله تعالى قال: ((لا تدركه الأبصار وهو يدرك الأبصار)). (ئیبن عەبباس)یش پێچەوانەی قسەكەی خاتوو (عایشە) دەڵێ. هەندێكی دیكە دەڵێن: نە لە دونیاو نەلە قیامەتدا خوا نابینرێ !! دیارە ئەمەیش بە رەواڵەت پێچەوانەی ئایەتی:(وجوه يومئذ ناضرة إلى ربها ناظرة) (٧٥/٢٢-٢٣)،وەپێچەوانەی ئایەتی: (كلا إنهم عن ربهم يومئذ لمحجوبون) (٨٣/١٥)یە.

## بە چاوی دڵ بنۆرن بۆ خوا:

﴿١٠٤ قد جاءكم بصائر من ربكم﴾ بە ڕاستیی لە لایەن پەروەردگارتانەوە چاوی هەقبین و، دڵی وشیارو، هۆی تێگەیاندن و بەڵگەی روونتان بۆهات، هەتا ڕێی ڕاست بدۆزنەوە ﴿فمن ابصر فلنفسه﴾ ئینجا هەركەسێك ڕێی دەركردو، بە دڵ تێگەیشت و، باوەری هێنا، بێگومان بۆخۆی قازانجە ﴿ومن عمى فعليها﴾ و هەركەسێكیش لەئاستی راستییەكان چاوی دڵی كوێرو نابینابوو، دیارە گوناهو تاوانەكەی دەكەوێتە سەرخۆی ﴿وما انا عليكم بحفيظ﴾ خۆمنیش پارێزەرو چاودێری ئێوەنیم، هەتا بتوانم لەكاری ناپەسەند لاتاندەم ﴿١٠٥ كذلك نصرف الآيات﴾ ئێمە هەرئاوا گشت بەڵگەو نیشانەكان ئاڵۆگۆڕ دەكەین و، جۆراو جۆر دەیانخەینە روو، تاهەق وناهەق دەركەوێ ﴿وليقولوا درست﴾ كەچی بێ باوەڕەكان لەباتی ئەوە باوەڕبێنن، گەیشتنە ئەو رادەیە بڵێن: تۆ بۆخۆت ئەم قورئانەت لای ئەم و ئەو خوێندووە، نەك لە خواوە هاتبێ ﴿ولنبينه لقوم يعلمون﴾ دەشمانەوێ ئەوقورئانە روون بكەینەوە بۆخەڵكانێك لە شت تێدەگەن ودەزانن ﴿١٠٦ اتبع ما يوحى إليك من ربك﴾ دەبێ هەر لەوفەرمانە پەیڕەوی بكەیت كە لە لای پەروەردگارتەوە بەوەحی بۆت دێت ﴿لا إله إلا هو﴾كە

الجزء السابع — سورة الأنعام

ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ خَٰلِقُ كُلِّ شَىْءٍ فَٱعْبُدُوهُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ وَكِيلٌ ﴿١٠٢﴾ لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَٰرُ وَهُوَ يُدْرِكُ ٱلْأَبْصَٰرَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٠٣﴾ قَدْ جَآءَكُم بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمْ فَمَنْ أَبْصَرَ فَلِنَفْسِهِۦ وَمَنْ عَمِىَ فَعَلَيْهَا وَمَآ أَنَا۠ عَلَيْكُم بِحَفِيظٍ ﴿١٠٤﴾ وَكَذَٰلِكَ نُصَرِّفُ ٱلْءَايَٰتِ وَلِيَقُولُوا۟ دَرَسْتَ وَلِنُبَيِّنَهُۥ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿١٠٥﴾ ٱتَّبِعْ مَآ أُوحِىَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٠٦﴾ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشْرَكُوا۟ وَمَا جَعَلْنَٰكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِوَكِيلٍ ﴿١٠٧﴾ وَلَا تَسُبُّوا۟ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَيَسُبُّوا۟ ٱللَّهَ عَدْوًۢا بِغَيْرِ عِلْمٍ كَذَٰلِكَ زَيَّنَّا لِكُلِّ أُمَّةٍ عَمَلَهُمْ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِم مَّرْجِعُهُمْ فَيُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٠٨﴾ وَأَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ لَئِن جَآءَتْهُمْ ءَايَةٌ لَّيُؤْمِنُنَّ بِهَا قُلْ إِنَّمَا ٱلْءَايَٰتُ عِندَ ٱللَّهِ وَمَا يُشْعِرُكُمْ أَنَّهَآ إِذَا جَآءَتْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠٩﴾ وَنُقَلِّبُ أَفْـِٔدَتَهُمْ وَأَبْصَٰرَهُمْ كَمَا لَمْ يُؤْمِنُوا۟ بِهِۦٓ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَنَذَرُهُمْ فِى طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١١٠﴾

١٤١

جگە لەوپەروەردگارەش هیچ پەستراوێکی تر شیاوی پەرستن نیە ﴿واعرض عن المشركين﴾ تۆئێستا واز لە موشریکان و هاوبەشدانەران بێنە و، ڕووهەر لەخوا بکە ﴿١٠٧ ولو شاء الله ما اشركوا﴾ دیاریشە ئەگەر خوا ویستبای ئەوانە هاوبەشی بۆ دانەنێن، نەیاندەتوانی هاوبەشی بۆدابنێن، بەڵکو ئەهاتنە سەر ڕێی ڕاست، چونکە هەموو شتێ بەبڕیارو فەرمانی ئەودەبێ ﴿وما جعلناك عليهم حفيظا﴾ ئەمەش بزانە کە تۆمان نەکردۆتە بەرپرس و چاودێرو ژمێریاری کارو کردەوەیان ﴿وماانت عليهم بوكيل﴾ وپارێزەر و بریکاری کاروباریشیان نیت.

**جنێو بەبتی کافران مەدەن, هەتاخوا نەناسانیش بە ( خوا )ی نێوەی نەدەن:**

(ئیبن عەباس) دەڵێت: بێباوەڕەکان بە پەیامبەریان ﷺ وت: دەبێ یا تۆ بەرامبەر بە خواکانی ئێمە واز لە قسەی خراپ بێنی، یان ئێمەش سووکایەتی بە خواکەی تۆ دەکەین. (قەتادە)یش ئەڵێت: موسڵمانەکان قسەی سووکایەتییان بە بتەکان دەکردو ، بێباوەڕەکانیش جنێویان بە خوای موسڵمانان دەدا، ئەوجا ئەو ئایەتە هات وفەرمووی:﴿١٠٨ ولا تسبوا الذين يدعون من دون الله﴾ ئێوە جنێوو قسەی خراپ دەربارەی ئەو بتانە مەکەن، کە ئەوخەڵکانە لە باتی خوا ئەیانپەرستن ﴿فيسبوا الله عدوا بغير علم﴾ ئەوجا ئەوانیش بە دژایەتیی و نەزانین، جنێو بە(الله) بدەن. (قال العلماء: حكمها باق في هذه الأمة على كل حال, فمتى كان الكفار في منعة وخيف أن يسب الإسلام ، أوالنبي ﷺ، أوالله، فلا يحل لمسلم أن يسب صلبانهم ولا دينهم ولا كنائسهم ، ولا يتعرض إلى ما يؤدي إلى ذلك، لأنه بمنزلة البعث على المعصية. وفي الآية -أيضاً- ضرب من الموادعة، ودليل على وجوب الحكم بسد الذرائع، وفيهادليل على أن المحق قد يكف عن حق له إذا أدى إلى ضرر يكون في الدين) قورتوبی دەڵێت: زاناکان دەڵێن: ئەم بڕیاری جنێو نەدانە بە پەرستراوی خوانەناسان، هەموو کات لەناو ئەم ئوممەتەدا بەردەوام دەبێ و دەمێنێتەوەو دەبێ کاری پێ بکرێت، کەوابوو هەرکات کافرەکان بە دەسەڵات و قودرەتمەند بوون و، لەوانەبوو جنێو بە دینی ئیسلام، یان بە خوای گەورە بدەن، وە یان سووکایەتی بە پێغەمبەر ﷺ بکەن، قەت لەوحاڵەدا ڕەوانییە موسڵمانەکان جنێو بە دین و بە کەنیشتەو، بە خاچەکەیان بدەن، تەنانەتی نابێ شتێ بورووژێنرێت سەر بکێشێ بۆ ئەوکارە، چونکە کاری ئاوا وەکو ئەوەوایە دنە بدرێت لەسەر نافەرمانی و یاخیبوون لەخوا. وە ئەم ئایەتە (موادەعە)و وازهێنان لە کافرانیشی تێدایەو، دیسان بەڵگە بۆ ئەوەیش کە بڕیار بە (سد الذرائع) دەدرێ و پێی قایل دەبین، هەروەکو ئەم ڕاستییەشی تێدایە کە: خاوەن ماف گەلێ جار دەبێ دەست لە مافی خۆی هە ڵبگرێت، ئەگەر کارێکی خراپ وناشیاو لەداواکردنەکەیدا دەوەشایەوەو،زیانێکی دینی لێ پەیدادەبوو﴿كذلك زينا لكل أمة عملهم﴾ هەرچۆنێ ئەوانە بەرگری لەخوا ناهەقەکانیان دەکەن، هەرئاوایش بۆ هەموو دەستەو کۆمەڵێک کارو کردەوەکانیان بۆ دەرازێنینەوەو، بەرگرییان لێدەکەن ﴿ثم إلى ربهم مرجعهم﴾ بۆدواییش هەردێنەوە لای پەروەردگاریان ﴿فينبئهم بماكانوا يعملون﴾ ئەوسایش لەگشت کاروکردەوکانیان بەئاگایان دەکات. پەیامبەر ﷺ لەبارەی قسەی خراپ و جێنودان بەیەکتری دەفەرموێ: (ملعون من سب والديه، قالوا كيف يسب الرجل والديه؟ قال: يسب أبا الرجل، فيسب أباه، ويسب أمه، فيسب أمه).حديث صحيح. واتە: ئەوی جنێو بە دایک و بابی خۆی بدات نەحلەتی لێکراوە" گوتیان: چۆن دەبێ مرۆڤ جنێو بە دایک و بابی خۆی بدات؟ فەرمووی: ئەم جنێو بەدایک و بابی ئەم دەدا، ئەویش جنێوەکە بەدایک و بابی ئەم دەداتەوە. ﴿١٠٩ واقسموا بالله جهد ايمانهم﴾ بەگشت هێزیانەوە سوێندیان بە خوا خوارد ﴿لئن جائتهم آية﴾ کە هەر موعجیزەو نیشانەیەکیان بۆبێت ﴿ليؤمنن بها﴾ باوەڕی پێ بکەن ﴿قل إنما الآيات عندالله﴾ پێیان بڵێ: تەواوی بەڵگەو نیشانەکان تەنها بە دەستی خوان و، من هیچ دەسەڵاتێکم نی یە ، شتێکی

سادەشتان بۆبێنم ﴿وما يشعركم انها إذا جاءت لا يؤمنون﴾ ئێوە چوزانن کە ئەگەر ئەو موعجیزانەشیان بۆ بێت ، ئەوان هەرباوەڕناکەن ﴿[110] ونقلب افئدتهم وابصارهم﴾ ئیتر ئێمە دڵ و چاویان لەئاستی هەق وەردەگێڕین ولە کاردەخەین ﴿كما لم يؤمنوا به أول مرة﴾ هەروەك چۆن لە سەرەتاوە بڕوایان پێ نەهێنا، کەوابوو هەربەڵگەیەکی تریش بێنین هەربڕوای پێناکەن ﴿ونذرهم فى طغيانهم يعمهون﴾ ئێمەش لەسەر لێشێواوی خۆیاندا دەیانهێڵینەوە باهەمیشە لەگێژاودا بتلێنەوە.

## ڕێنمایەکانی ئایەتی (١٠٨-١١٠):

١- هەر قسەو کردارێ ببێتە مایەی جنێودان لەلایەن موشریك و بێ باوەڕانەوە بەخواو بە پێغەمبەر ﷺ ئەو قسەو کردارە حەرام دەبێت.

٢- لەبەر هەر حیکمەتێك خوای خۆی چاك دەزانێ هەمووکارێکی دزێوو خراپ لای خاوەنەکەی جوان و شیرین دەکرێت، ئەوسا دەیکات.

٣- هیدایەت و ڕێنمایی تەنیا بە دەستی خوایە، بۆیە گەلێ جار موعجیزەش دێ و خەڵکەکە هەر بڕوا ناهێنن!.

کۆتایی جزمی حەوتەم

ولله الحمد والمنة

*** *** ***

الجزء الثامن — سورة الأنعام

الحزب ٨ النصف ١٥

۞ وَلَوْ أَنَّنَا نَزَّلْنَا إِلَيْهِمُ الْمَلَائِكَةَ وَكَلَّمَهُمُ الْمَوْتَى وَحَشَرْنَا
عَلَيْهِمْ كُلَّ شَيْءٍ قُبُلًا مَا كَانُوا لِيُؤْمِنُوا إِلَّا أَن يَشَاءَ اللَّهُ وَلَٰكِنَّ
أَكْثَرَهُمْ يَجْهَلُونَ (١١١) وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا
شَيَاطِينَ الْإِنسِ وَالْجِنِّ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ
الْقَوْلِ غُرُورًا وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ
(١١٢) وَلِتَصْغَىٰ إِلَيْهِ أَفْئِدَةُ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ
وَلِيَرْضَوْهُ وَلِيَقْتَرِفُوا مَا هُم مُّقْتَرِفُونَ (١١٣) أَفَغَيْرَ اللَّهِ
أَبْتَغِي حَكَمًا وَهُوَ الَّذِي أَنزَلَ إِلَيْكُمُ الْكِتَابَ مُفَصَّلًا
وَالَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَعْلَمُونَ أَنَّهُ مُنَزَّلٌ مِّن رَّبِّكَ بِالْحَقِّ
فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ الْمُمْتَرِينَ (١١٤) وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا
وَعَدْلًا لَّا مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِهِ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ (١١٥) وَإِن
تُطِعْ أَكْثَرَ مَن فِي الْأَرْضِ يُضِلُّوكَ عَن سَبِيلِ اللَّهِ إِن
يَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ (١١٦) إِنَّ رَبَّكَ هُوَ
أَعْلَمُ مَن يَضِلُّ عَن سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ (١١٧)
فَكُلُوا مِمَّا ذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ إِن كُنتُم بِآيَاتِهِ مُؤْمِنِينَ (١١٨)

١٤٢ — ومالكم ألا

لەپێشەوە کافرەکان سوێندیان خواردوگوتیان: (لئن جاءتهم آية ليؤمنن بها..) کە ئەگەر بێ لە قورئان نیشانەو ئایەتێکی تریان بۆ هاتبا، بێ سوو باوەڕیان پێدەکرد! یان گوتیان: (.. لن نؤمن حتى نؤتى مثل ما أوتي رسل الله..) یان گوتیان: (.. لو لا انزل علينا الملائكة أو نرى ربنا ..) جابۆ ئەوەی پێغەمبەرﷺ بەتەمای ئیمانیان نەبێت، فەرمووی: ﴿[111] ولو اننا نزلنا إليهم الملائكة﴾ ئەگەر فریشتەشمان ناردبایە لایان وبە چاو دیتبانیان وەك خۆیان داوایانکرد ﴿وكلمهم الموتى﴾ و مردووەکانیش زیندوو بووناپەتەوەو قسەیان لەگەڵ کردبان بۆ ڕاستیی تۆ ﴿وحشرنا عليهم كل شئ قبلا﴾ و هەموو ڕابوردوانیشمان ڕوو بە ڕوویان کۆ کردبایەتەوە وشایەتیی ڕاستیتۆیان دابا ﴿ما كانوا ليؤمنوا إلا أن يشاء الله﴾ باوەڕیان نەدەهێنا مەگەر خوا ئارەزووو ویستی لێبا، ئەگینا هەرگیز باوەڕ ناهێنن، دەیارە ئەمە بێ هیواو مەیووسبوونە لە باوەڕهێنانیان ،هەتا پێغەمبەریشﷺ بەتەمایان نەبێ ﴿ولكن اكثرهم يجهلون﴾ بەڵام زۆربەیان نەزان و بێ ئاگان لەم ڕاستیانە.

**هەموو پێغەمبەرێك ناحەزێکی بنیادەمیی و جنی هەبووە:**

﴿[112] وكذلك جعلنا لكل نبى عدوا شياطين الإنس والجن﴾ هەر چۆنێ قورەیش نەیارو دژی تۆن ئەی پێغەمبەرﷺ! دڵنیابە بۆ هەموو پەیامبەرێکی دی شەیاتینی دژو نەیارمان ، لەئادەمیی و، لەجنیی داناوە،

(وەرەقـەی کـوری نەوفـەل) بـە پێغەمبـەری گـوت: هەرپێغەمبـەرێك هـاتبێ، وەکـو تـۆ دژایـەتی کـراوە (متفـق علیه). پەیغەمبەر بە (ئەبوو زەڕ)ی فەرموو: لە شەیاتینی بنیادەم و جنۆکە، پەنات بردە بەرخوا؟ ئەویش گوتی: بۆ لە مرۆڤیشدا شەیاتین هەیە؟! فەرمووی: بەڵێ، (تەبەریی).

**بـەکورتیی:** هـەموو مرۆڤێکـی سـنوور بـەزێن شـەیتانە، کـەوابوو هـەموو سەرکەشـێك دەبێتـە شـەیتان، بۆیـە دەفەرموێ: (الكلب الأسود شيطان) موسلیم: کتاب الصلاة/ ٣٦٥ . ﴿يوحى بعضهم إلى بعض زخرف القول غرورا﴾ کە هەندێکیان "بۆ فریـودان" گوتـەی ڕازاوەو بـێ نـاوەڕۆك بـە هەنـدێ خـەڵکی سـادە رادەگـەیـەنن" بەمەبەسـتی لـە خشتە بردن وچەواشەکردن وترساندنیان لەرێی هەق" دەساتۆێش بەئارامبە ﴿ولو شاء ربك ما فعلوه﴾ دڵنیابە کە ئەگەر پەروەردگارت ویستبای ئەوانە دژوو نەیار نەبن و، ئەوجۆرە قسانە هەڵنەبەسن ، هـەرگیز نـەیان ئـەتوانی ئـەو کارە بکەن، بەڵام حیکمەتی خۆی لەوەدایە کە هـەر پێغەمبـەرەی دژوو نـەیارێکی هـەبێ ﴿فذرهم وما يفترون﴾ دەسا تـۆش لـەخۆیان ولـەو درۆو دەلەسـەیە هەڵیدەبەسـتن وازبهێنەو،درێژەبـەکاری خۆتبـدە، چـونکە تـۆ خـوا سـەروەرو پشتیوانتە ﴿[١١٣] ولتصغى إليه افئدة الذين لا يؤمنون بالآخرة﴾ و دەبا ئیتر ئەوانەی وا بڕوایان بە ڕۆژی دوایی نیە، هەردڵی بدەنێ و، گوێی بۆ ڕاگرن ﴿وليرضوه وليقترفوا ماهم مقترفون﴾ وقسەکەیان پەسەندبکەن و پێی ڕازی بن و، هەرتاوانێکیش ئەکەن با بیکەن" چونکە تەنها ئەو کەودەنانە دوایان دەکەون و،پاشە ڕۆژیشیان هەر لای خۆمانە.

**لە ڕێنمایەکانی ئایەتی (١١١-١١٣):**

١- خوا مەیل و ویستی لە هەر شتێ ببێ ، بێگومان هـەر ئـەوە دەبـێ، حـەزیش بـە شـتێ نـەکا ، هـەر گیز نابێ، ئەمەیە مانای (ئولوهیەت و ربوبیەت)ی خوای گەورەو، قەزاو قەدەر کەلەئەزەلدا بڕیاری لەسەرداوە.

٢- سەرەخۆشـیی و دڵدانـەوەی پێغەمبـەر ﷺ بـەوە کـە هـەر پێغەمبـەرێك وەکـو تـۆ دژوو نـەیاری لـە نێـو شەیتانەکانی بنیادەم و جنۆکەدا هەبووە، بەڵام خوا پێغەمبەرەکەی خۆی سەر خستووە بەسەریانا.

٣- مرۆڤ هەردەم دەبێ ورياو وشیاربێ، تا لە خشتە نەبرێ، چونکە فریودان و لە خشتە بردن تەنها چەکێکە بۆ شەیتان.

٤- ئـەو دڵانـە کـە کـافرو خوانەناسـن، هەمیشـە بـۆ فەسـادو خراپـەو کـاری باتـڵ ئـامـادەترن، تالـەو دڵانـەی کـە بڕوادارن.

﴿[١١٤] افغير الله ابتغى حكما﴾ پێیـان بڵـێ: ئـاخۆ ڕەوایـە جگـە لـە خـوای بەدەسـەڵات کەسـێتر بکەمـە داوەری نێوانمان؟ هەتا شایەتی بدات کاممان ڕاست دەکات ؟ ﴿وهو الذي انزل إليكم الكتاب مفصلا﴾ کە هەرئەویشە ئەم قورئانەی بە ڕۆشنکراوەیی دابەزاندۆتە خوارەوە بۆتان و، سەرجەم بڕیارەکانیشی ڕوونن ﴿والذين آتيناهم الكتاب﴾ خـۆ ئەوانـەیش وا نامـەمان پێـداون ﴿يعلمون انه منزل من ربك بالحق﴾ چاك دەزانـن کـە ئـەو قورئانـە لـەلای پەروەردگارتەوەیەو، گشتیشی ڕاست و دروستە ﴿فلا تكونن من الممترين﴾ دەسا تـۆ هـەرگیز لەخەڵکانی دوودڵ و بەگومان مەبە، گومانت نەبێ کە ئەم قورئانـە خوا ناردوویە ﴿[١١٥] وتمت كلمة ربك صدقا وعدلا﴾ و گشت وتـەکانی پەروەردگارت (قورئان) و سەرجەم بڕیارەکانی، لە ڕاستیی ودادگەرییدا، تـەواو بـەپایان گەیشـتوون و بـێ وێنـەن ﴿لا مبدل لكلماته﴾ نابێ هیچ کەسێ دەسکاریی وئاڵوگۆڕیان بکا ﴿وهوالسميع العليم﴾ هەرئـەو خـۆی چاك دەبیسـێ و، باش زاناو ئاگادارە بەهەمووشتێك.

**زۆرینەی خەڵك گومڕاو سەرلێشێواوە:**

﴿١١٦ وإن تطع أكثر من في الأرض﴾ ئەگەر لە زۆربەی خەڵكانی ئەم سەر زەوییە، كە بێ باوەڕن پەیڕەوی بكەیت ﴿يضلوك عن سبيل الله﴾ لە ڕێگەی خوا لات دەدەن و چەواشەو سەر لێشێواوت دەكەن ﴿إن يتبعون إلا الظن﴾ چونكە خۆیشان هەر دوای دوو دڵی و بەدگومانی دەكەون ﴿وإن هم إلا يخرصون﴾ وهەر بە تەخمین و بەد گومانی لەپڕوپووچ خەریكن ودەگەڕێن، ئەگینە هیچ بەڵگەیەكی ئەو تۆیان نییە.

**ئەو حەیوانە حەلاڵە، كەسەر دەبڕێ بەناوی خواوە بێ:**

﴿١١٧ إن ربك هو أعلم من يضل عن سبيله﴾ بێگومان پەروەردگار ت زۆر باشتر بەئاگاو زانایە لەحاڵی ئەو كەسانە لە ڕێی خوا لایانداوە ﴿وهو أعلم بالمهتدين﴾ وباشتریش ئەو كەسانە دەناسێ شارەزای ڕێگەی ڕاستن و ڕێنمان .ئیمامی (ترمزیی) ئەڵێ: كۆمەڵە خەڵكێك هاتنە لای پێغەمبەرﷺ وتیان: ئەوحەیوانە ئێمە خۆمان دەیكوژینەوە بەپاكی دەزانین و لێی دەخۆین، حەیوانێكیش كە بە قسەی خوا بكوژرێتەوە, واتە: بەو شێوە ئێوە دەڵێن سەر ببڕێ، بەپاكی نازانین ولێی ناخۆین، ئاخۆ ئەم ڕاو بۆچوونە چۆن بێ ؟ جا بۆئەو وەلامە ئەم ئایەتە هات وفەرمووی: ﴿١١٨ فكلوا مما ذكر اسم الله عليه﴾ دەسا ئێوە ئەی موسڵمانان! لە گۆشتی ئەو ئاژەڵانە بخۆن كە لە كاتی سەر بڕینیاندا ناوی خوایان لە سەرهێنراوە ﴿إن كنتم بآياته مؤمنين﴾ ئەگەر ڕاستە بڕواتان بە ئایەت و بەڵگەكانی خواهەیە، واتە: لەو حەیوانانە مەخۆن كە: یان مردارەوە بوون ، یان بۆغەیری خوا سەربڕاون ﴿١١٩ وما لكم الا تأكلوا مما ذكر اسم الله عليه﴾ دە بۆچی ئێوە لە گۆشتی ئەوپەلەوەرو ئاژەڵانە ناخۆن كە ناوی خوایان لەسەر دێ ؟ ﴿وقد فصل لكم ما حرم عليكم﴾ خۆهەرشتێكی لێحەرامكردبن ، بەباشی بۆی شیكردونەتەوە، واتە: بەتەواوی حەلاڵ و حەرامی بۆ لێكجیاكردونەتەوە، دەسا ئێوەیش تخونی حەرامەكان مەكەون ﴿إلا ما اضطررتم إليه﴾ مەگەر شتێك لە ڕووی ناچارییەوەبێ، واتە: هەر چەندەئەوپەلەوەرو ئاژەڵە نارەواو یاساغ بێ و ناوی خوای لی نەهێنرابێ، لەكاتی ناچارییدا بۆتان رەواو حەلاڵ دەبێ خواردنی ﴿وإن كثيرا ليضلون بأهوائهم بغير علم﴾ خۆ زۆرێ لەو مەردمەش هەر بە ئارەزووی خۆیان و، بێ هیچ جۆرە زانست و زانیارییەك خەڵكێك سەر لێشیواو ئەكەن، واتە: بەئارەزووی خۆیان حەلاڵ حەرام دەكەن و، حەرام حەلاڵ دەكەن ! ﴿إن ربك هو أعلم بالمعتدين﴾ بە ڕاستی پەروەردگارت لەحاڵی خەڵكانی زێدەڕۆو، سنوور بەزێن لە هەموو كەسێ بەئاگاو زاناترە ﴿١٢٠ وذروا ظاهر الإثم وباطنه﴾ خەڵكینە! ئێوە لە تاوان وگوناهانی ئاشكراو نهێنی، خۆبپارێزن و وازبهێنن ﴿إن الذين يكسبون الإثم﴾ بێگومان ئەوانەی وا گوناح و تاوان دەكەن ﴿سيجزون بما كانوا يقترفون﴾ بێ سۆ لە تۆڵەی

الجزء الثامن — سورة الأنعام

وَمَا لَكُمْ أَلَّا تَأْكُلُوا مِمَّا ذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ وَقَدْ فَصَّلَ
لَكُم مَّا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ إِلَّا مَا اضْطُرِرْتُمْ إِلَيْهِ ۗ وَإِنَّ كَثِيرًا لَّيُضِلُّونَ
بِأَهْوَائِهِم بِغَيْرِ عِلْمٍ ۗ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِالْمُعْتَدِينَ ﴿١١٩﴾
وَذَرُوا ظَاهِرَ الْإِثْمِ وَبَاطِنَهُ ۚ إِنَّ الَّذِينَ يَكْسِبُونَ الْإِثْمَ
سَيُجْزَوْنَ بِمَا كَانُوا يَقْتَرِفُونَ ﴿١٢٠﴾ وَلَا تَأْكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ
اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُ لَفِسْقٌ ۗ وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰ
أَوْلِيَائِهِمْ لِيُجَادِلُوكُمْ ۖ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ ﴿١٢١﴾
أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَاهُ وَجَعَلْنَا لَهُ نُورًا يَمْشِي بِهِ فِي
النَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُ فِي الظُّلُمَاتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا ۚ كَذَٰلِكَ
زُيِّنَ لِلْكَافِرِينَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١٢٢﴾ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا
فِي كُلِّ قَرْيَةٍ أَكَابِرَ مُجْرِمِيهَا لِيَمْكُرُوا فِيهَا ۖ وَمَا
يَمْكُرُونَ إِلَّا بِأَنفُسِهِمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴿١٢٣﴾ وَإِذَا جَاءَتْهُمْ
آيَةٌ قَالُوا لَن نُّؤْمِنَ حَتَّىٰ نُؤْتَىٰ مِثْلَ مَا أُوتِيَ رُسُلُ اللَّهِ ۘ اللَّهُ
أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُ ۗ سَيُصِيبُ الَّذِينَ أَجْرَمُوا
صَغَارٌ عِندَ اللَّهِ وَعَذَابٌ شَدِيدٌ بِمَا كَانُوا يَمْكُرُونَ ﴿١٢٤﴾

١٤٣

گوناهە ئاشكراو نهێنییەكانیاندا سزا دەدەرێن ﴿[121] ولا تأكلوا مما لم يذكر اسم الله عليه﴾ هەرپەلەوەرو حەیوانێ لەكاتی سەر بڕیندا ناوی خوای لە سەر نەهێنرابێت ، ئێوە لە گۆشتەكەی مەخۆن ﴿وإنه لفسق﴾ بێگومان ئەو جۆرە خواردنە، تاوان و گوناحەو لە ڕێگە دەرچوونە ﴿وإن الشياطين ليوحون إلى أوليائهم﴾ وبشزانن كە شەیاتینەكان هەمیشە شتی پڕوو پووچ ئەخەنە دڵی دۆستەكانیانەوەو، دنەیان دەدەن ﴿ليجادلوكم﴾ بۆئەوە موجادەلەو دەمە قاڵێتان لەگەڵ بكەن و، كێشەوگرفتان بۆ بنێنەوە ﴿وإن اطعتموهم إنكم لمشركون﴾ خۆ ئەگەر بە گوێتان كردن لە گوتەو كارو بۆ چوونەكانیاندا، دڵنیابن ئێوەیش موشریك وهاوبەشدانەرن، چونكە پەیڕەوی كردنی غەیری بەرنامەی خوا ، كوفرو هاوەڵدانانە بۆخوا.

**لە ڕێنمایەكانی ئایەتی (١١٨-١٢١):**

١- خواردنی گۆشتی هەموو ئاژەڵێكی سەر بڕاو بە دەستی موسڵمان حەلاڵە.

٢- (بسم الله..) كردن لەسەرهەموو ئاژەڵ و پەلەوەرێك لەكاتی سەر بڕینیدا واجب و پێویستە، بۆیە هەندێ لە زاناكان دەڵێن: (بسم الله)كردن لە كاتی سەر بڕیندا واجیبە، كەوابوو بە پێی ڕای ئەمانە هەر موسڵمانێك ئاژەڵێكی سەربڕیی و بەدەست ئەنقەست ناوی خوای لەسەر نەهێنا، ئەو گۆشتە حەرامە لای ئەو دەستەیە.

٣- هەندێك ئەڵێن: ئەگەر بە هەڵەو لە بیرچوون بوو، قەیدی نیەودەخورێ.

٤- دەبێ پەیڕەوی لەفیقهی زانایان بكرێ و، لە هەوا بازانەوە دووربگرین.

٥- دەبێ لەهەموو گوناحەكان- بەدەست بكرێن، یان بەبەدڵ - خۆ بپارێزین.

٦- هەموو جۆرە سەربڕاوێك بە دەستی هاوبەشدانەرو ئاگرپەرست و، خوا نەناس و(مورتەد)و خەڵكانی عەلمانیی ناخورێ، بۆیە پێوستە موسڵمانان هەرگیزلای ئەوانە گۆشت نەكڕن .

**موسڵمان زیندووەو، خوانەناس مردوو:**

﴿[122] أو من كان ميتا فأحييناه﴾ ئاخۆ كەسێك مردووبێ و، ئینجا زیندوویكەینەوە، واتە: كافرو بێ بڕوابێ، پاشان ئیمان و باوەڕبخەینە دڵیەوەو باوەر بێنێ ﴿وجعلنا له نورا يمشي به في الناس﴾ و ڕووناكیی و نووریشی بدەینێ و، ڕێی خۆی پێدەركاو، بەسەر بەستیی لە ناو مەردمدا هاتوو چۆ بكات ﴿كمن مثله في الظلمات﴾ وەكو كەسێ وایە لەناو تاریكییەكانی شیرك و سەرلێشێواویدا بێت ﴿ليس بخارج منها﴾ كە هەرگیزیش نەتوانێ خۆی لێ ڕزگار بكاو بێتە دەرێ ؟ دیارە هەر ئەوكەسەیە زیندەو خاوەن نوور، ئەمەش نموونەی ڕێگاو ڕێبازی ڕاستی مرۆڤی بڕوادارە، ئەویشیان مەسەل و نموونەی مرۆڤی لاسارو، ڕێگا چەوتەكەی بێ باوەڕانە، وەك (ئیبن عەباس) ئەڵێ. ﴿كذلك زين للكافرين ما كانوا يعملون﴾ وەكو چۆن ئیمان و بڕوا لای بڕواداران جوان ورازاوەیە، هەروا ئەو كەسانەش بێ بڕواو كافرن، كارە خراپەكانیان لاجوانە و، هەمووكارێكی خراپ ودزێو بەچاكدەزانن !.

**فرت و فێڵی تاوانباران و، چارەنووس و ڕێی و شوێنیان:**

﴿[123] وكذلك جعلنا في كل قرية اكابر مجرميها﴾ هەرچۆنێ گەورە پیاوانی مەككە - شارەكەی تۆ- دەستیان دایە كاری خراپ ونامەردانە، هەر ئاواش پیاوخراپ و تاوانكارانمان لەناوچەی هەرپەیغەمبەرێكدا كردە سەركردەو دەسەڵاتدارو گەورەو ڕابەریان ﴿ليمكروا فيها﴾ هەتا دەستیان دایە فرو فێڵ و چەواشەكاریی تێیداو، ڕوو بە ڕووی پەیامبەرەكان وەستان، كەوابوو تۆش لەگەڵە لاسارەكەت دڵزویرمەبە ﴿وما يمكرون إلا بأنفسهم﴾ خۆ فرو فێڵیش هەر لە خۆیان دەكەن و، ئەنجامەكەشی هەر لەسەرخۆیان دەكەوێ و ﴿وما يشعرون﴾ هەستیشی پێناكەن ﴿[124] وإذا

جاءتهم آية﴾ هەرکە موعجیزەو بەڵگەیەکیان بۆدێ بۆ ڕاستی پەیامبەرﷺ ﴿قالوا لن نؤمن حتى نؤتى مثل ما أوتي
رسل الله﴾ دەڵێن: تائەو بەڵگانە بە پەیامبەرانی خوا دراون، بەئێمەیش نەدرێن، هەرگیز باوەڕناکەین ﴿الله أعلم
حيث يجعل رسالته﴾ خۆ خوا خۆی باشتر دەزانی، پەیامی خۆی لە کوێ دابنێ و، چ کەسێ بکات بە پەیامبەر.
﴿سيصيب الذين أجرموا صغار عند الله وعذاب شديد بما كانوا يمكرون﴾ دڵنیابن ئەوانەی کە ناهەقیکارو
تاوانباربوون، سووکیی و سەر شۆڕیی و، سزایەکی زۆر توندیان لای خوا تووش دەبێ ﴿ [١٢٥] فمن يرد الله أن يهديه
يشرح صدره للإسلام﴾ ئینجا ئەوکەسە کە خوا بیەوێ ڕێنمایی بکات بۆ دینی ئیسلام، دڵ و سنگی فراوان و
گوشاد دەکاو، پاداشی قیامەتی لاشیرین ئەکاو، ئەوجا زۆر بەئاسانی دینی ئیسلام قبووڵدەکات، پێغەمبەری
خوادەفەرموێ: ئەو موسڵمانە زیرەکە کە هەمیشە مردنی
لەبیربێ و، هەوڵەکانی بۆ خۆسازدان بێت بۆ پاش مردن،
لێشیان پرسی: دڵان چۆن گوشادو فراوان دەبن بۆ
وەرگرتنی دینی ئیسلام..؟ فەرمووی: نورێك لەلایەن
خواوەوە دەهاوێژرێتە ناویەوە، ئەوسا بەرچاوی ڕوون
دەبێتەوەو ڕێی پێدەر دەکا، گوتیان: نیشانەیەك بۆ ئەوە
هەیە؟ فەرمووی: بەدەوام بیرکردنەوە لە یانەی نەمریی و،
دوورکەوتنەوە لەخۆشەویستی دنیای فریو دەرو،
خۆئامادەکردن بۆ پاش مردن نیشانەیەتی/ تەبەریی. ﴿ومن
يرد أن يضله﴾ کێش خۆی حەز بکا گومڕای بکا ﴿يجعل
صدره ضيقا حرجا﴾ وا بەتوندی نەفەس تەنگی دەکا
﴿كأنما يصعد في السماء﴾ دەڵێی بەرەو ئاسمان
سەردەکەوێ ﴿كذلك يجعل الله الرجس على الذين لا
يؤمنون﴾ ئەوکەسانەی وا بڕواناهێنن، هەر بەوشێوازە خوای
گەورە شەیتان زاڵ دەکات بەسەر یاندا ﴿ [١٢٦] وهذا صراط
ربك مستقيما﴾ ئەم شەریعەت و بەرنامەیە ڕێکەو ڕێی
پەروەردگاری تۆیە، سەرجەم ڕاستەو لاڕێی تێدا نیە ﴿قد
فصلنا الآيات لقوم يذكرون﴾ بێگومان بۆ ئەوانەی لە ئامۆژگاری کەڵك و سوود وەردەگرن، بە ڵگەکانمان ڕوون
دەکەینەوە ﴿ [١٢٧] لهم دار السلام عند ربهم﴾ ئەو خاوەن باوەڕانە لە پەروەردگاری ئەوانەوە (دار السلام-
بەهەشت)یان بۆ هەیە ﴿وهو وليهم﴾ کە هەر ئەوپەروەردگارە- لەدنیاو، لەقیامەتدا-پشتیوان و یاریدەریانە ﴿بما
كانوا يعملون﴾ ئەو پاداشەیان لەبەر ئەوکارە چاکانەیە ئەنجامیاندان ﴿ [١٢٨] ويوم يحشرهم جميعا﴾ ئەو ڕۆژەیان
وەبیربێنە کە خوای گەورە تەواوی ئادەمیی و جینیی وئاغاو پەرستراوەکانیان کۆ ئەکاتەوەودەفەرموێ: ﴿يا معشر
الجن قد استكثرتم من الإنس﴾ ئەی دەستەو کۆمەڵی جننیەکان! بەڕاستیی ئێوە خەڵکێکی زۆرتان لەبەرەی
ئادەمیی ڕامکردو گومڕاتان کردن ﴿وقال أولياءوهم من الإنس﴾ مرۆڤە دۆستە ڕامکراوەکانیان دەڵێن: ﴿ربنا
استمتع بعضنا ببعض﴾ ئەی پەروەردگاری ئێمە! ڕاستە برێکمان لەبرێکی تر کەڵکی وەرگرت و بەهرەمەند بوون،

جینیەکان بە ئیتاعەی ئێمەی مرۆڤ بەهرەیان بردوو خۆشحاڵ بوون، خۆشمان بەجێبەجێکردنی فەرمانی ئەو جنۆکە ئاغانەمان دڵشاد بووین ، وا ئێستا گیرۆدەی کاری خۆمان بووین ﴿وبلغنا اجلنا الذی اجلت لنا﴾ ئەو ئەجەل و وادەیەش بۆت دیاریکردبووین، پێیگەیشتین و مردین، واتە: تەمەنی چاکیشمان بەسەر برد، هەقبوو بیربکەینەوە، کەچی هەرلارو لاسار بوین ﴿قال النار مثواکم﴾ خوا فەرموی: لەتۆڵەی ئەوەدا ئاگری دۆزەخ جێگای گشتتانە ﴿خالدین فیها إلا ما شاء الله﴾ و بەهەتا هەتاییش تێیدا دەبن، مەگەر خوا بەمەیلی خۆی بیگۆڕێ، یان سزا نەدا، واتە:هەر ئەو ماوە(بەرزەخییە) بێ سزادەبن کە دەنێردرێن بۆ دۆزەخ ﴿إن ربك حكيم عليم﴾ بەڕاستیی پەروەردگارت زۆر لە کارزان و کارجوانە، زۆریش بەئاگاو زانایە ﴿[129] وكذلك نولی بعض الظالمين بعضا﴾ و هەروەك جنیی و ئادەمیی کەڵك لە یەکتر وەردەگرن و، جنیەکان ئادەمییەکان دەچەوسێننەوەو زاڵدەبن بەسەریاندا، هەر ئاوایش هەندێ لە ستەمکاران دەخەینە ژێر دەسەڵاتی برێکی تریان و ریسواو سەرشۆڕیان دەکەن، پاشانیش یەکتر لەناو ئەبەن ﴿بما كانوا يكسبون﴾ بە هۆی ئەو ئەوکارە ناپەسەندانەوە دەیانکردن.

**خوا نەناس شایەتی لەخۆی دەدا :**

﴿[130] یامعشر الجن والإنس﴾ ئەی کۆمەڵی جنیی و ئادەمیی! ﴿الم يأتكم رسل منكم﴾ مەگەر هەر لە خۆتان (لەئادەمیی) چەند پەیامبەرێکتان بۆ نەهاتن ﴿يقصون عليكم آياتي﴾ ئایەت و نیشانەکانی منتان بۆ بخوێننەوە ﴿وينذرونكم لقاء يومكم هذا﴾ ولە گەیشتن ودیمانەی ئەم رۆژەتان بترسێنن ﴿قالوا شهدنا على انفسنا﴾ کاتێ هیچیان بۆ نامێنێتەوە ئەڵێن: بەڵێ ئەی پەروەردگار! شایەتی لەسەر خۆمان ئەدەین: بەڵێ پەیامبەرانی تۆ هاتن و، نامەکەشیان گەیاندپێمان ﴿وغرتهم الحياة الدنيا﴾ئەوجا خوای گەورە فەرمووی: ئەم ژیانە زرق وبرقەی گێتیە فریویدان ﴿وشهدوا على انفسهم﴾ و شایەتیشیان لەسەر خۆیان دا ﴿انهم كانوا كافرين﴾ کە راستییەکەی ئەمەیە: کافرو خوانەناس بوون ﴿[131] ذلك أن لم يكن ربك مهلك القرى بظلم﴾ ناردنی ئەو پەیامبەرانە لە بەر ئەوەیەکە ئێوە چاك بزانن هەرگیز پەروەردگارت هیچ شارو گوندێکی بەناهەقیی قڕ نەکردووە ﴿وأهلها غافلون﴾ و دانیشتووەکانیشی خافڵ و بێ ئاگاو بێ تاوان بووبن، واتە: هەتا ئێمە پەیامبەرنەنێرین و، ئەوانیش لێی لا نەدەن، قاریان لێناگرین ﴿[132] ولكل درجات مما عملوا﴾ بۆ هەر مرۆڤێك-چاك، یان خراپ- لە بەرامبەر ئەو کارەی کردوویەتی، چەندین پلەو پایە هەیە، وپاداش وتۆڵەش وەردەگرن ﴿وما ربك بغافل عما يعملون﴾ خوا پەروەردگاریشت هەرگیز لەو کارەی ئەیکەن بێ ئاگاو خافڵ نیە، واتە: هەوڵ وتێکۆشانی هیچ کەسێك بزرنابێ.

ڕێنمایەکانی ئایەتی (١٢٩-١٣٢):

١- بەرەی جننی زاڵدەبن بەسەربەری ئینسانداو، کاری خراپ وبێفەڕیان پیدەکەن و، گومڕاوسەرلێشێواو دەبن.

٢- وریابە بە ژیانی ئەم دنیایە فریو نەخۆیت.

٣- هاتنی پێغەمبەران بۆ نیشاندانی رێگەی ڕاستەو نەمانی بروبیانوو و بەڵگەی خەڵکە.

٤- پاداش و تۆڵە هەر بەپێی کارو کردەوەیە.

﴿[133] وربك الغنى ذوالرحمة﴾ وە پەروەردگاری تۆ لەتەواوی خەڵکی، بێ نیازەو، خاوەن بەزەیی و دلۆڤانە ﴿إن يشأ يذهبكم﴾ ئەگەر بیەوێ لاتان ئەباو لە ناودەچن ﴿ويستخلف من بعدكم ما يشاء﴾ لە پاش ئێوەیش حەزی لە هەرچینێکی تربێ لەجێتاندا دایدەنێ ﴿كما انشأكم من ذرية قوم آخرين﴾ هەرچۆنێ ئێوەی لە تۆرەمەو نەوەی گەلێکی تر خستەوە ﴿[134] إن ما توعدون لآت﴾ بێگومان هەربڕیارێکتان بۆدەدرێ - لە پاداشت وتۆڵە- بێ دواکەوتن

پێشدێت ﴿وما انتم بمعجزين﴾ خۆ ناشتوانن یەکی خوابخەن ونەهێڵن کارەکانی ئەنجام بدات ﴿[١٣٥] قل يا قوم اعملوا على مكانتكم﴾ –ئەی پێغەمبەر! ﷺ–بڵێ: ئەی هۆزەکەم! هەرچی لە دەستتان دێت، درێغی مەکەن و، هەربەوشێوەیە کاربکەن هەڵتان بژاردووە بۆخۆتان، واتە: کەخۆتان بەراست دەزانن، دەسا لەسەر ئەو کاری خۆتانە بەردەوامبن ﴿إني عامل﴾ بێگومان منیش هەرخەریکی کاری خۆم دەبم ﴿فسوف تعلمون من تكون له عاقبة الدار﴾ ئەوساچاك ئەزانن پاشەرۆژی چاك و باشی ئەوماڵەکە بۆ کێ ئەبێت ؟ ﴿إنه لا يفلح الظالمون﴾ بێگومان هەرگیز ستەمکاران بەختیارو رزگار نابن، واتە: ئێوەسەر لێشێواوو ناهەقن، منیش راست ولەسەرهەقم.

**رێنمایەکانی ئایەتی (١٣٣-١٣٥):**

١- خوای گەورە لە هەموو بوونەوەر دەوڵەمەندترو بێ نیازە.

٢- دەسەڵات و توانایی خوای کارجوان بۆ لەناو بردنی ئەو خەڵکانەو، هێنانی دەستەیەکی تر لەجێی ئەواندا.

٣- بەڵێنەکانی خوا هەرگیز دواناکەون.

٤- هاوبەشدانەران ئەگەر بەردەوام بن لەسەر ئەو کارەیان، ئەوا بەتوندی سزایان بۆ دێ.

الجزء الثامن　　سورة الأنعام

وَلِكُلٍّ دَرَجَٰتٌ مِّمَّا عَمِلُواْ وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا
يَعۡمَلُونَ ١٣٢ وَرَبُّكَ ٱلۡغَنِيُّ ذُو ٱلرَّحۡمَةِ إِن يَشَأۡ
يُذۡهِبۡكُمۡ وَيَسۡتَخۡلِفۡ مِنۢ بَعۡدِكُم مَّا يَشَآءُ كَمَآ
أَنشَأَكُم مِّن ذُرِّيَّةِ قَوۡمٍ ءَاخَرِينَ ١٣٣ إِنَّ مَا
تُوعَدُونَ لَأٓتٍ وَمَآ أَنتُم بِمُعۡجِزِينَ ١٣٤ قُلۡ يَٰقَوۡمِ
ٱعۡمَلُواْ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمۡ إِنِّي عَامِلٌ فَسَوۡفَ تَعۡلَمُونَ
مَن تَكُونُ لَهُۥ عَٰقِبَةُ ٱلدَّارِ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ
١٣٥ وَجَعَلُواْ لِلَّهِ مِمَّا ذَرَأَ مِنَ ٱلۡحَرۡثِ وَٱلۡأَنۡعَٰمِ
نَصِيبًا فَقَالُواْ هَٰذَا لِلَّهِ بِزَعۡمِهِمۡ وَهَٰذَا لِشُرَكَآئِنَا
فَمَا كَانَ لِشُرَكَآئِهِمۡ فَلَا يَصِلُ إِلَى ٱللَّهِ
وَمَا كَانَ لِلَّهِ فَهُوَ يَصِلُ إِلَىٰ شُرَكَآئِهِمۡ
سَآءَ مَا يَحۡكُمُونَ ١٣٦ وَكَذَٰلِكَ زَيَّنَ
لِكَثِيرٍ مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ قَتۡلَ أَوۡلَٰدِهِمۡ
شُرَكَآؤُهُمۡ لِيُرۡدُوهُمۡ وَلِيَلۡبِسُواْ عَلَيۡهِمۡ دِينَهُمۡ
وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَا فَعَلُوهُ فَذَرۡهُمۡ وَمَا يَفۡتَرُونَ ١٣٧

١٤٥

**کارو کردەوەی خوانەناسان!:**

﴿[١٣٦] وجعلوا لله مما ذرا من الحرث والأنعام نصيبا﴾ لەبەروبووی ئەو کێڵگەو کشت و ئاژەڵ ومەڕوماڵاتە خوا خۆی دروستیکردبوو، هەر بەشێکیان بۆ خوا دانا !! بەشەکەی تریان جیایان کردەوە بۆ گەروەو بتەکانیان ! ﴿فقالوا هذا لله بزعمهم﴾ ئەوساش بێ بەڵگەو لێکدانەوە، بەڵکو هەربەخەیاڵی خۆیان وتیان: ئەمە بۆخوایە!! ﴿وهذا لشركائنا﴾ وئەمەیش هی هاوبەش و (بتەکان)مانە ﴿فما كان لشركائهم فلا يصل إلى الله﴾ جا ئەوەی هی بت و هاوبەشەکانیان بوو، هەرگیز نەئەگەیشتە لای خوا ﴿وما كان لله فهو يصل إلى شركائهم﴾ کەچی ئەوی بەشی خوابوو ئەگەیشتە لای بتەکانیان !! دیارە لەکارو بۆچوونێکی زۆر نارەواو هەڵەدا بوون، چونکە لەوەگەڕێ کەشەریکیان بۆخوا دانابوو، لە دابەشکردنەکەیشدا هەر ناراست دەرچوون، ئەوەتە بەشەکەی خوایش دەخەنە سەربەشی بتەکانیان و، لەوەیشدا هەر درۆیانکرد! ﴿ساء ما يحكمون﴾ چ خراپ بڕیارێك ئەدەن، چونکە هێمان بتەکانیان لاخۆشەویستر بوو لەخوا.

**موشریکان منداڵەکانیان دەکوژن:**

﴿[١٣٧] وكذلك زين لكثير من المشركين قتل اولادهم شركاؤهم﴾ شەیاتینەکان هەروەك ئەوکارەیان بۆئەو موشریکانە رازاندەوە، هەروا (بتەوانە) موشرکەکانیش وایانکرد کە زۆرێ لە هاوبیرەکانیان کوشتنی منداڵەکانیان لا جوان وپەسەندبێت ! بۆیە دەیانتوانی کیژەکانیان زیندەبەچاڵبکەن ﴿ليردوهم﴾ بۆئەوە لەناویان بەرن ﴿وليلبسوا

علیهم دینهم﴾ و بۆ ئەوە ئایینەکەیانیان لێ بشێوێنن ﴿ولو شاء الله ما فعلوا﴾ دڵنیابن ئەگەر خوا ویستبای ئەوکارە نەکەن ، نەیاندەکرد، دەیتوانی بەزۆریش بێت لەو هەڵەیە بیانگێڕێتەوە ﴿فذرهم وما یفترون﴾ دەساتۆش لە خۆیان و لە درۆو دەلەسەکەیان کە ئەیانگوت خواشەریك و هاوبەشی هەیە وازبهێنە ، خوای گەورە خۆی بەدەردیانەوەدێت

﴿[١٣٨] وقالوا هذه انعام وحرث﴾ ودەیانگوت: ئەم ئاژەڵ ومەڕو ماڵات و کشت وکاڵ وکێڵگەیە ﴿حجر لا یطعمها إلا من نشاء بزعمهم﴾ قەدەغەو یاساغن و نابێ هیچ کەسێك -بێ ئیزنی ئێمە- لێیان بخوات بە درۆی ئەوان ، واتە: بە درۆی خۆیان دەیانگوت: خواردنیان حەرام و قەدەغەیە مەگەر بۆ کەسێك خۆمان بمانەوێ ﴿وانعام حرمت ظهورها﴾ دەشیانگوت: ئەم ماڵات و وشترانەش نابێ کەس سوارییان ببێ، نەبۆحەج و، نەبۆ هیچ شتێکی تر ﴿وانعام لا یذکرون اسم الله علیها﴾ هەروا ئەم ماڵاتەش کە لە هیچ کاتێکا نابێ ناوی خوای لەسەر بهێنرێت، چونکە تەنها بۆ بتەکانن ﴿افتراء علیه﴾ ئەمەیش درۆ لەسەر خوا دەکەن کە دەڵێن خوا فەرمانی پێکردوین و، بەدینداریی دا دەنێن !! ﴿سیجزیهم بما کانوا یفترون﴾ بێگومانبن لەبەر ئەودرۆو دەلەسەیانە خوا تۆڵەیان ئەدا ﴿[١٣٩] وقالوا ما بطون هذه الأنعام خالصة لذکورنا﴾ جۆرێکی تری درۆو کارە ناڕەواکانیان ئەمە بوو کە دەیانگوت: هەرشتێ لە سکی ئەم ئاژەڵانەدایە هەربۆ نێرینەو پیاوەکانمان حەڵاڵ و ڕەوایە ﴿ومحرم علی أزواجنا﴾ بۆ ژنان و مێینەکانمان ناڕەواو حەرامە ﴿وإن یکن میتة فهم فیه شرکاء﴾ خۆ ئەگەر مردارەوە بووبا، ژن و پیاویان تێدا بەشدار دەبوون !! بەڵێ هەرکە مرۆڤ لە یاسای خوا لابدات، ئابەو شێوەیە خۆی سەر لێشواو دەکاو جۆرەها یاسای ئاڵۆز بەسەر خۆیی و گەلدا دەسەپێنێ، بۆیەدەبێ مرۆڤ هەمیشە تەسلیم وملکەچی بڕیارەکانی خوای گەورەبێ و، تاڵە موویەك لانەدات، بۆیە دەفەرموێ: ﴿سیجزیهم وصفهم﴾ بێ سۆ خوا تۆڵەی ئەو درۆو دەلەسەیەیان دەدا ﴿إنه حکیم علیم﴾ بێگومان هەر خۆیەتی کارزان و کار جوان ، زۆریش داناو زانا، ئەزانێ چ کارێکی دزێوو ناپەسەندیان کردو، دەشزانێ چییان شایستەیە ﴿[١٤٠] قد خسر الذین قتلوا اولادهم سفها بغیر علم﴾ بە ڕاستیی ئەوانەی- بەگەوجیی ونەزانیی- مناڵەکانی خۆیانیان کوشت ، لەبەر هەژاریی، یان لەبەر دەمارگیریی ! دیارە کە لەدنیاو لەقیامەتدا زیانیانکرد ﴿وحرموا ما رزقهم الله﴾ وە بەدەر لەوەش ڕزقی خوایان لێ حەرامکردبوون ﴿إفتراء علی الله﴾ بەدرۆو دەلەسە لەسەر خوا، گوایا بەفەرمانی خوا بووە! ﴿قدضلوا وما کانوا مهتدین﴾ بێگومان گومڕا بوون و ڕێی ڕاستیان نەدۆزییەوە و، هەمووشتێکیشیان لە دەستدا. خوای کارجوان لۆمەو سەرکۆنەی هاوبەشدانەرەکانی کرد، لەبەر ئەوە کە کافرو بێ باوەڕن بوون و، هاوبەشێکی هەمە جۆرەیان بۆ دانابوو، لە کاتێکا بە تەنها ئەو خوایە. (ئیبن عەبباس) دەڵێ: ئەگەر کێڵگەیەك، یان باخێ، یان ئاژەڵ و ماڵاتێکیان هەبووبا، بەشێکیان



وَقَالُوا۟ هَٰذِهِۦٓ أَنْعَٰمٌ وَحَرْثٌ حِجْرٌ لَّا يَطْعَمُهَآ إِلَّا مَن نَّشَآءُ بِزَعْمِهِمْ وَأَنْعَٰمٌ حُرِّمَتْ ظُهُورُهَا وَأَنْعَٰمٌ لَّا يَذْكُرُونَ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَيْهَا ٱفْتِرَآءً عَلَيْهِ ۚ سَيَجْزِيهِم بِمَا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴿١٣٨﴾ وَقَالُوا۟ مَا فِى بُطُونِ هَٰذِهِ ٱلْأَنْعَٰمِ خَالِصَةٌ لِّذُكُورِنَا وَمُحَرَّمٌ عَلَىٰٓ أَزْوَٰجِنَا ۖ وَإِن يَكُن مَّيْتَةً فَهُمْ فِيهِ شُرَكَآءُ ۚ سَيَجْزِيهِمْ وَصْفَهُمْ ۚ إِنَّهُۥ حَكِيمٌ عَلِيمٌ ﴿١٣٩﴾ قَدْ خَسِرَ ٱلَّذِينَ قَتَلُوٓا۟ أَوْلَٰدَهُمْ سَفَهًۢا بِغَيْرِ عِلْمٍ وَحَرَّمُوا۟ مَا رَزَقَهُمُ ٱللَّهُ ٱفْتِرَآءً عَلَى ٱللَّهِ ۚ قَدْ ضَلُّوا۟ وَمَا كَانُوا۟ مُهْتَدِينَ ﴿١٤٠﴾ ۞ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَ جَنَّٰتٍ مَّعْرُوشَٰتٍ وَغَيْرَ مَعْرُوشَٰتٍ وَٱلنَّخْلَ وَٱلزَّرْعَ مُخْتَلِفًا أُكُلُهُۥ وَٱلزَّيْتُونَ وَٱلرُّمَّانَ مُتَشَٰبِهًا وَغَيْرَ مُتَشَٰبِهٍ ۚ كُلُوا۟ مِن ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثْمَرَ وَءَاتُوا۟ حَقَّهُۥ يَوْمَ حَصَادِهِۦ ۖ وَلَا تُسْرِفُوٓا۟ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿١٤١﴾ وَمِنَ ٱلْأَنْعَٰمِ حَمُولَةً وَفَرْشًا ۚ كُلُوا۟ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعُوا۟ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ ۚ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿١٤٢﴾

نصف الحزب ١٥

لێدادەنا بۆ خواو، بەشێکیشی بۆ بتەکان و، بۆدواتریش بەشەکەی خوایان دەخستە نێوبەشی بتەکانەوە ، هەروا وشتری (بەحیرە، ساییبە، وصیلە، حام) یان دادەنا بۆ بتەکان و لە خوایان حەرام دەکرد!! و هەر حەیوانێکیشیان بکوشتایەتەوە بۆ خوا، تا ناوی بتەکانیان نەبردبا نەیان دەخوارد!! کەچی ئەوەی بۆ بتەکانیان سەردەبڕی قەت نیوی خوایان لەسەر نەئەهێنا!! هەروەها لەترسی برسییەتی، یان لەبەر عەیب وعار، منداڵەکانی خۆیانیان دەکوشت !! ئەوەندەش نەفامبوون ئەگەر مەرو ماڵاتەکەیان نێرینەی بوایە ، سەریان دەبڕیی و بەشی ژنانیان لێ نەئەدا. وە هەر(ئیبن عەباس) دەڵێ: ئەگەر دەتەوێ نەفامی عەرەبەکان بزانیت، بچۆ لەئایەتی (١٣٠)ی سوورەتی (ئەنعام)ـەوە بخوێنەوە: (قد خسر الذين قتلوا أولادهم سفها بغير علم، وحرموا ما رزقهم الله افتراء على الله قد ضلوا و ما كانوا مهتدين) ئەوجا دەزانی کە چەندە نەزان و نەفامبوون.

## ڕێنمایەکانی ئایەتی (١٣٦-١٤٠):

١- داهێنانی هەر یاسایەکی دژ بەشەرعی خوا، قەدەغەو حەرامە.

٢- هەرشتێ نەزر بکرێ بۆ دارو بەرد، یان بۆ گۆڕو گۆڕستان ، یان بۆ پیرو ئەولیاکان، ئەونەزرە قەدەغە و حەرامەو دانامەزرێت.

٣- خەڵك کوشتن بە ناهەق و، ڕێگرتن لە منداڵ بوون (تحديد النسل) بێ هیچ بەرنامەو هۆیەکی شەرعیی کارێکی ناپەسەندو حەرامە.

## هەرخوایە گشت باغ و باغات و بەروبوو بەدی دێنێ:

﴿[141] وهو الذى انشأ جنات معروشات وغير معروشات﴾ پاش باسکردنی ئەوهەموو هەڵەنەیان، لەم ئایەتەدا دایان ئەچڵەکێنێ و، ئەیەوێ بیان هێنێتەوە سەر ڕێی ڕاست و تێیان بگەیەنێت کە نابێ ئەوجۆرە کارە نابەجێیانە بکەن، چونکە هەموشتێ هی خوایە، ئەمانەش و ئەوانەیش، بۆیە ئەفەرموێ: خوا هەرئەو بە دەسەڵاتەیە کە جۆرەها باخاتی وەدیهێناوە، هێندێکیان داربەست و کەپری دەوێ، هەندێکیشیان کەپرو داربەستی ناوێ ﴿والنخل والزرع مختلفا اكله﴾ هەروا جۆرەها خورماو مەزراو کشتیشی وەدی هێنا، کە تام وبۆن و ڕەنگیشیان لێك جیاوازە ﴿والزيتون والرمان متشابها﴾ وە زەیتوون و هەناریشی بەدیهێنا، کە گشت جۆرەکانی بەرواڵەت لە یەکتر دەچن ﴿وغير متشابه﴾ و لە تام و ڕەنگا جیاوازن و لە یەك ناچن ﴿كلوا من ثمره إذا اثمر﴾ دەسا هەرکە میوەکەیان پێگەیشت ، بۆتان هەیە لێیبخۆن ﴿وآتوا حقه يوم حصاده﴾ وە لەڕۆژی دروێنەو میوە چنینیشدا بەشەکەی خوا جیابکەنەوەو (زەکات)ی لێبدەن و، هەژارەکان دڵخۆش بکەن ﴿ولا تسرفوا﴾ بەڵام زیادە ڕەویی مەکەن و، لەسنووری دەرمەچن , بەتایبەتی لە بەخششدا، واتە: هیچ شتێ بە ناهەق وەرمەگرن و، بەناهەقیش بەم و بەوی مەدەن. ﴿إنه لا يحب المسرفين﴾ بێگومانبێ خوا زیادە ڕەوانی خۆشناوێ، واتە: باهەمیشە دەستتان بە دەم هەژارەکانەوە بێ و، لەو خێرو بێرە بێ بەشیان مەکەن، بەڵام دەبێ لەسنووری خۆیدابێ و، بەچەشنێ نەبێت کە گشت سەروەتەکەتان ببەخشن و، ئەوساش بەدەستی خاڵی بۆخۆتان دابنیشن ﴿[142] ومن الأنعام حمولة وفرشا﴾ وەلەناو ئاژەڵەکاندا بڕێکی بۆ باروسواریی و، بڕێکیشی بۆ کوڵکەو خوریی وخواردن بۆ دروستکردن ﴿كلوا مما رزقكم الله﴾ دەسا لەوگشت بژێویی و، ڕسق و ڕۆزییە خوا پێیداون بخۆن ﴿ولا تتبعوا خطوات الشيطان﴾ هەرگیزیش دوای نەخشەو هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون، واتە: لە خۆتانەوە هیچ شتێ حەرام مەکەن و، هیچ شتێکیش حەڵاڵ مەکەن ﴿إنه لكم عدو مبين﴾ چونکە (شەیتان) بە ئاشکرا دوژمنتانە ﴿[143] ثمانية ازواج﴾ لە ئاژەڵ وماڵاتیشدا هەشت جووت (گۆشت

خوراوی) بۆ دروست کردن، وەکودەفەرموێ: ﴿من الضأن اثنين﴾ لە جۆری مەردا دووان" مەڕو بەران" ﴿ومن المعز اثنين﴾ و لە جۆری بزنیشدا دوان- نێرو مێی- تگەو بزن ﴿قل آلذكرين حرم أم الأنثيين﴾ بڵێ: ئا خۆ خوا نێری ئەو دووانەی یاساغکردووە، یان مێینەکانیان؟ واتە: ئەوانە کە کشت وکاڵ وئاژەڵ و مەرو ماڵات لەخۆ حەرام ئەکەن و، پێیان وایە کە: خوا لەسەری قەدەغە کردوون، پێیان بڵێ: کاری وا زۆر جێگەی سەرسورمانەو، زۆریش لەژیرییەوە دوورە ﴿أماشتملت عليه أرحام الأنثيين﴾ یان ئەوی حەرامکردووە لە منداڵدانی مێیینەکاندایە؟ جائەگەر ئەوانە قسەی ئاوا بکەن، ئەوەهیچی وانییە، چونکە گەڵێ جار گۆشتەکەیان ئەخۆن و سواری وشترەکان ئەبن، کەوابوو ئەم قەدەغە کردنەیان لە کوێوە هێنا؟ ئەگەر لە بەر نێرینەکان بێت ، دەبێ هەموونێرینەکان لێیان حەرامبن ، خۆ ئەگەر لەبەر مێیینەکانیش بێت ، دیسان دەبێ مێیینەکان هەموو حەرامبن لێیان، دەسا ئیتر ئێوە ئەمەتان لەکوێ هێنا کە: بتوانن هەندێ حەرامبکەن و، هەندێکیش حەڵاڵ؟! ﴿نبئوني بعلم إن كنتم صادقين﴾ دەسا ئەگەر ڕاست ئەکەن -لە داواکەتاندا- کەدەڵێن خوا (بەحیرەوسایبەو وەصیلەو حام)ی حەرامکردووە ، بەڵگەیەکی راست ورەوانم نیشان بدەن ﴿[144] ومن الإبل اثنين ومن البقرالإثنين﴾ لە جۆری وشتریش دوانی "نێرو مێ و" لە جۆری گایش دوانی نێرومێی بۆفەراهەمهێنان ﴿قل آلذكرين حرم أم الأنثيين اما اشتلمت عليه ارحام الأنثيين﴾ هەمیسان بڵێ: باشە! نێرەکانی حەرامکردووە، یان مێیینەکانیان، یان ئەوی لەمنداڵدانی مێییەکاندایە؟ ﴿ام كنتم شهداء إذ وصاكم الله بهذا﴾ یان ئێوە لەوێبوون ئەوکاتە کە خوا ئەم مەبەستەی پێڕاسپاردن ؟ واتە: کاتێ ئەو جۆرە ماڵیاتانەی لێدنەرامکردن ئێوە بۆ خۆتان ئاگادار بوون؟! ﴿فمن أظلم ممن افترى على الله كذبا﴾ جادەبێ چ کەسێ لەوکەسە ستەمکارترو سەرکێش تربێت ، کە درۆو دەلەسە لە سەر خوا هەڵبەسێت؟ ﴿ليضل الناس بغير علم﴾ وبێ ئەوە هیچ جۆرە زانیارییەکی لەوبارەوە هەبێ، وخەڵکیش گومڕا وسەرلێشێواو بکا ﴿إن الله لا يهدي القوم الظالمين﴾ بە ڕاستیی خوای گەورە گەلی ستەمکار ئاشناو شارەزای ڕێگەی راست ناکات. ئەمەیش سەر لێشیواوییەکی تری عەرەبەکان بوو کە لەپێش ئیسلامدا هەندێ مەڕو ماڵات و میوەیان لە خۆ حەرامدەکرد، پاشان خوای گەروە بۆی روونکردنەوە کە بەتوانایی خۆی باخی پڕ لە درەختی لاق بەرزو، لاق نزمی بۆ بەدیهێناون ، ئەوەبوو فەرمووی: (وهوالذى أنشأ جنات معروشات) ئەوسایش جۆرەها حەیوانی بۆ سواریی و، بۆگۆشتەکەیان دروستکردو فەرمووی: ((ومن الأنعام حمولة وفرشا ..)) ئینجا لێرەدا جۆری ئاژەڵەکانی بۆ باسکردن، فەرمووی: ((ثمانية أزواج ..إن الله لا يهدى القوم الظالمين)) رایشیگەیاند کە هیچ شتێك لەوانەی حەرام نەکردووە لێیان، جا ئیتر ئەو یاسای حەرامکردنەیان لە کوێ هێناوکردیان بەدین ؟!



ثَمَٰنِيَةَ أَزْوَٰجٍ مِّنَ ٱلضَّأْنِ ٱثْنَيْنِ وَمِنَ ٱلْمَعْزِ ٱثْنَيْنِ
قُلْ ءَآلذَّكَرَيْنِ حَرَّمَ أَمِ ٱلْأُنثَيَيْنِ أَمَّا ٱشْتَمَلَتْ عَلَيْهِ
أَرْحَامُ ٱلْأُنثَيَيْنِ نَبِّـُٔونِى بِعِلْمٍ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٤٣﴾
وَمِنَ ٱلْإِبِلِ ٱثْنَيْنِ وَمِنَ ٱلْبَقَرِ ٱثْنَيْنِ قُلْ ءَآلذَّكَرَيْنِ
حَرَّمَ أَمِ ٱلْأُنثَيَيْنِ أَمَّا ٱشْتَمَلَتْ عَلَيْهِ أَرْحَامُ ٱلْأُنثَيَيْنِ
أَمْ كُنتُمْ شُهَدَآءَ إِذْ وَصَّىٰكُمُ ٱللَّهُ بِهَٰذَا فَمَنْ
أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا لِّيُضِلَّ ٱلنَّاسَ بِغَيْرِ
عِلْمٍ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٤٤﴾ قُل لَّآ أَجِدُ
فِى مَآ أُوحِىَ إِلَىَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٍ يَطْعَمُهُۥٓ إِلَّآ أَن يَكُونَ
مَيْتَةً أَوْ دَمًا مَّسْفُوحًا أَوْ لَحْمَ خِنزِيرٍ فَإِنَّهُۥ رِجْسٌ أَوْ
فِسْقًا أُهِلَّ لِغَيْرِ ٱللَّهِ بِهِۦ فَمَنِ ٱضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَإِنَّ
رَبَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤٥﴾ وَعَلَى ٱلَّذِينَ هَادُوا۟ حَرَّمْنَا
كُلَّ ذِى ظُفُرٍ وَمِنَ ٱلْبَقَرِ وَٱلْغَنَمِ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ
شُحُومَهُمَآ إِلَّا مَا حَمَلَتْ ظُهُورُهُمَآ أَوِ ٱلْحَوَايَآ أَوْ مَا
ٱخْتَلَطَ بِعَظْمٍ ذَٰلِكَ جَزَيْنَٰهُم بِبَغْيِهِمْ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴿١٤٦﴾

رێنمایەکانی ئایەتی (١٤١-١٤٤):

١- خواردنی خورماو ترێ و هەنارو زەیتون حەڵاڵە.

٢- دەبێ خورماو زەیتوون و دانەویڵە- بە مەرجەکانی خۆیان- زەکاتیان لێبدرێ.

٣- خواردنی بەشێ لە خورماو ترێ بە فەریکەیی- بەر لەزەکات لێدەرکردنیان-حەڵاڵە.

٤- گۆشتی مەڕو بزن و وشترو گا-نێرو مێیان- حەڵاڵە.

٥- مافی هەڵوەشانەوەی یاسا جاهیلیەکان و، (حەرام وحەڵاڵ)کردن بەتەنیا هەقی خوایە.

٦- گفتو گۆ بەشێوەی (موناظەرە)و رووبەڕوو لەپێناوی ناساندنی بەرنامەی هەق و بەرنامە باتڵەکاندا کارێکی ڕەوایە.

**ئەم شتانەن لێتان قەدەغەن:**

﴿[١٤٥] قل لا أجد فيما أوحي إلي محرما على طاعم يطعمه﴾ بەوانە که لە خۆیانەوە ئەو ئاژەڵ ومەڕو ماڵاتە یاساغ ئەکەن بڵێ: لەوشتانەدا خوای گەورە بەوەحی بۆی ناردوم ، شتێك نابینمەوە خواردنی لە کەسێك حەرام بێ، باشە! ئێوە ئەو هەموو شتانەتان چۆن حەرامکرد؟ ﴿إلا أن يكون ميتة أو دما مسفوحا أو لحم خنزير﴾ بێجگە لە مردارەوە بوو" یان خوێنێکی ڕژێندراو، یان گۆشتی بەراز ﴿فإنه رجس﴾ کە بێگومانە ئەو (بەراز)ە هەموو گیانی پیس و قیزەونە ﴿أو فسقا أهل لغير الله به﴾ یان مەگەر ئاژەڵێ کە بە ناوی غەیری خواوە سەربڕابێ، دیارە ئەوجۆرە سەربڕینەش فیسق و لە سنوور دەرچوونەو، خواردنی یاساغە، دەسا چاك بزانن کە هەر ئەو جۆرە شتانە حەرامن، نەك ئەوانەی وا ئێوە بە ئارەزووی خۆتان حەرامیان دەکەن ﴿فمن اضطر غير باغ ولا عاد﴾ ئینجا هەرکەسێك بە ناچاریی و بەبێ ئارەزوو، ئەو حەرامانە بخواو، لە ئەندازەی پێویست نەچێتەدەر، هیچ گوناهێکی ناگا﴿فإن ربك غفور رحيم﴾ چونکە بەڕاستیی پەروەردگارت – بەتایبەتی لە کاتی وادا– زۆر لێبوردەیە، زۆریش بەروحم و میهرەبانە، ئەوەتە لەکاتی ئاوادا رێگەتان لێناگرێ، بەپێی پێویست حەرامیش بخۆن ﴿[١٤٦] وعلى الذين هادوا حرمنا كل ذي ظفر﴾ گۆشتی هەموو ئاژەڵێکی نینۆکدارو (سمدار)مان وەك وشترە مراویی و .. لەسەر جوولەکەکان حەرامکرد ﴿ومن البقر والغنم حرمنا عليهم شحومهما﴾ پیوو چەوری گاو مانگاو مەڕیشمان لە سەر حەرامکردن ﴿إلا ماحملت ظهورهما أو الحوايا﴾ پیوو چەوری سەرپشت و رێخۆڵەکانیان نەبێ ﴿أو ما اختلط بعظم﴾ یان ئەو پیوەی تێکەڵی ئێسك بووبێ ، واتە: چەوری قەبرغەو دووگ ﴿ذلك جزيناهم ببغيهم﴾ ئەوتۆڵە و قارەشمان ، لەبەر سەرکەشیی و یاخیی بوونیان بوو، چونکە ئەوان پەیامبەرێکی زۆریان کوشت، ماڵ وسامانێکی زۆری مەردومیان بە تالان برد..! ئەوسا خوا زۆری بۆ هێنان و، ئاوا بەنی توندکردنەوە، واتە: حەرامکردنی ئەوانە بەهۆی تاوانی خۆیانەوە بوو، نەك لەبەر ئەوەبێ کەکاتی خۆی (یەعقووب) لە سەرخۆی حەرامی کردبێ، وەك ئەوانە دەڵێن، هەر بۆیە لەشوێنێکی تردا فەرمووێ: (فبظلم من الذين هادوا حرمنا عليهم طيبات..). ﴿وإنا لصادقون﴾ بێگومان ڕاستگۆودادپەروەریش بووین، هەر چییان پێکرا هەقی خۆیان بوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوا جوولەکە لەناو بەرێت! لەبەرلاساری خۆیان پیوو چەوریيان لێ قەدەغە کرا، کەچی بەفێڵ هەڵسان تواندیانەوەو فرۆشتیان و پارەکەییان خوارد ! متفق عليه. ﴿[١٤٧] فإن كذبوك فقل ربكم ذو رحمة واسعة﴾ ئینجا ئەگەر ئەو هاوبەشدانەرو جوولەکانە باوەڕیان پێنەکردیت و ، بەدرۆیان خستیتەوە، تۆیش بڵێ: پەروەردگارتان ئێجگار خاوەن ڕەحم و خاوەن بەزەییەکی فراوانە ، پەلە ناکات بە سزادانتان، ئەگینە هەرئێستا جەزرەبەی دەدان ﴿و لا يرد بأسه عن القوم

﴿المجرمين﴾ خۆ هه‌رگیز سزاو قاریشی له‌هۆزی تاوانباران، ره‌ت ناکرێته‌وه، واته: هه‌رکاتێ قاری له هۆزێ گرت، ره‌ت بوونه‌وه‌ی نییه، که‌وابوو هوشیاربن.

**رێنمایه‌کانی ئایه‌تی (١٤٥ - ١٤٧):**

١- هه‌موو جۆره‌مرداره‌وه بوویه‌ك، که له‌م سووره‌تی (ئه‌نعام)ـه‌و له سووره‌تی (مائیده) باسکراون گۆشتیان حه‌رامه، وه به‌فه‌رمووده‌ی ره‌وانیش- جگه له‌وانیش- ئێسترو که‌ری ماڵیش هه‌روا.

٢- هه‌ر درِونده‌یه‌کی که‌ڵبه‌دارو، هه‌موو په‌له‌وه‌ر ێکی قولابدار حه‌رامکراون.

٣- گوناحکردن، گه‌لێ جار ده‌بێته مایه‌ی بێ پیتی و بێ به‌ره‌که‌تی رِسق و، برِانی خێرو خۆشی لای خوا.

الجزء الثامن | سورة الأنعام

فَإِن كَذَّبُوكَ فَقُل رَّبُّكُمْ ذُو رَحْمَةٍ وَٰسِعَةٍ وَلَا يُرَدُّ
بَأْسُهُۥ عَنِ ٱلْقَوْمِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿١٤٧﴾ سَيَقُولُ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟
لَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشْرَكْنَا وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن شَىْءٍ
كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ حَتَّىٰ ذَاقُوا۟ بَأْسَنَا
قُلْ هَلْ عِندَكُم مِّنْ عِلْمٍ فَتُخْرِجُوهُ لَنَآ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا
ٱلظَّنَّ وَإِنْ أَنتُمْ إِلَّا تَخْرُصُونَ ﴿١٤٨﴾ قُلْ فَلِلَّهِ ٱلْحُجَّةُ ٱلْبَٰلِغَةُ
فَلَوْ شَآءَ لَهَدَىٰكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿١٤٩﴾ قُلْ هَلُمَّ شُهَدَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ
يَشْهَدُونَ أَنَّ ٱللَّهَ حَرَّمَ هَٰذَا فَإِن شَهِدُوا۟ فَلَا تَشْهَدْ
مَعَهُمْ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا وَٱلَّذِينَ
لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ وَهُم بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ ﴿١٥٠﴾ ۞ قُلْ
تَعَالَوْا۟ أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ أَلَّا تُشْرِكُوا۟ بِهِۦ
شَيْـًٔا وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَوْلَٰدَكُم مِّنْ
إِمْلَٰقٍ نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلْفَوَٰحِشَ
مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَلَا تَقْتُلُوا۟ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى
حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿١٥١﴾

١٤٨ | وَلَا تَقْرَبُوا۟ مَالَ

**موشریکان ده‌ڵێن: ئه‌ر خوا ویستبای موشریك نه‌ده‌بووین:**

﴿[١٤٨] سيقول الذين اشركوا﴾ ئه‌وکه‌سانه‌ی هاوه‌ڵیان بۆ خوا دانا، بێگومان بۆخۆ رِزگار کردنی خۆیان ئه‌ڵێن: ﴿لو شاء الله ما اشركنا ولا آباؤنا﴾ ئه‌گه‌ر خوا ویستبای که‌خۆمان و، باوو باپیرانمان هاوبه‌شی بۆدانه‌نێین، قه‌ت هاوبه‌شمان بۆ دا نه‌ده‌دنا ﴿ولا حرمنا من شئ﴾ و هیچ شتێکیشمان له‌خۆ یاساغ نه‌ئه‌کرد ﴿كذلك كذب الذين من قبلهم﴾ ئه‌وانه‌یش له پێشیانه‌وه بوون هه‌ر ئاوا وه‌کو ئه‌مانه باوه‌رِیان به‌پێغه‌مبه‌ران نه‌هێناو، که‌وتنه درۆو ده‌له‌سه هه‌ڵبه‌ستن و، به‌درۆیان خستنه‌وه ﴿حتى ذاقوا بأسنا﴾ هه‌تا سزاو قاری ئێمه‌یان بۆهات وچه‌شتیان ﴿قل هل عندكم من علم﴾ پێیان بڵێ: ئه‌گه‌ر به‌ڵگه‌یه‌کی زانستیان لایه بۆ راستیی بۆچوونه‌کانیان ﴿فتخرجوه لنا﴾ جابا بۆمانی ده‌ربخه‌ن ؟ ﴿إن تتبعون إلا الظن﴾ دیاره ئێوه ته‌نهادوای گومان وسه‌ر لێشێواوی ده‌که‌ون ﴿وإن انتم إلا تخرصون﴾ وه‌هه‌ر له‌خۆتانه‌وه ده‌خه‌مڵێنن و درۆ ده‌که‌ن ، ئه‌گینه هیچ به‌ڵگه‌یه‌کتان لانیه ﴿[١٤٩] قل فلله الحجة البالغة﴾ ده‌سا تۆ بڵێ: به‌ڵگه‌ی زۆر رِه‌ساو به‌قووه‌ت و تێرو ته‌واو، هه‌رهی خوایه‌و، ئێوه‌هیچ به‌ڵگه‌یه‌کی شیاوو به‌که‌ڵکتان لانییه ﴿فلو شاء لهداكم اجمعين﴾ خۆ ئه‌گه‌ر خودا ویستبای به‌ڵگه‌ی ره‌ساتان ده‌ست بخات ، هه‌مووتانی شاره‌زاو رێنما ده‌کرد ﴿[١٥٠] قل هلم شهداءكم الذين يشهدون ان الله حرم هذا﴾ بڵێ: ده‌سا ئه‌و شایه‌تانه بێنن شایه‌تی ده‌ده‌ن که خوای گه‌وره بۆخۆی ئه‌م شتانه‌ی حه‌رامکردووه ﴿فإن شهدوا فلا تشهد معهم﴾ جاگریمان ئه‌گه‌ر ئاماده بوون و شایه‌تییاندا ، تۆ شایه‌تییان له‌گه‌ڵ مه‌ده، واته: برِوایان پێ مه‌که، چونکه درۆزن وقسه هه‌ڵبه‌سن ﴿ولا تتبع أهواء الذين كذبوا بآياتنا والذين لا يؤمنون بالآخرة وهم بربهم يعدلون﴾ نابێ په‌یره‌وی له هه‌واو ئاره‌زووی ئه‌و که‌سانه بکه‌یت که‌ئایه‌ت و نیشانه‌کانی ئێمه به‌درۆ داده‌نێن و، به‌ئاره‌زووی خۆیان حه‌ڵاڵ و حه‌رام ئه‌که‌ن و، به رِۆژی دواییش باوه‌رِناکه‌ن و، هاوتاو هاوبه‌شیش بۆپه‌روه‌ردگاریان داده‌نێن و بت ده‌په‌رستن.

**ئەم سفارشانە باش وەرگرن:**

جا پاش باسکردنی ئەو شتانە کەئەوان بەئارەزووی خۆیان حەرامیانکردن لەسەر خۆیان، دێتە سەرباسی ئەوشتانە خوای گەورە لەبەر زیان وناشیاویان حەرامیکردوون، لەگەڵ ئەمەشدا (١٠)ڕاسپاردەو وەسیەتنامە باس دەکات کە: گشت شەریعەتە ئاسمانیەکانیش تێیدا یەکدەنگ بوون ، وەك ئەفەرموێ: ﴿[١٥١] **قل تعالوا اتل ما حرم ربکم علیکم**﴾ بەو کافرو بێ باوەڕانە بڵێ: وەرن بائەو شتانەتان بۆبخوێنمەوە کە پەروەردگارتان یاساغیکردوون لەسەرتان: ﴿**الا تشرکوا به شیئا**﴾ یەکەم: نابێ هیچ شتێك بکەنە شەریك و هاوبەشی خوا، واتە: شیرك قەدەغەو حەرامە، دەبێ ئێوە پێی قایەل نەبن. ﴿**و بالوالدین احسانا**﴾ دووەم: لەگەڵ باوك و دایکدا هەمیشە ئاکارچاکبن. ﴿**ولا تقتلوا أولادکم من إملاق**﴾ سێیەم: لە ترسی برسێتیی و هەژاریی، منداڵەکانتان مەکوژن، بەڵێ.. کەسی وایان هەبوو - لەبەر هەژاریی ونەداریی بێ جیاوازی- نێرومێی ئەکوشت!

هەندێ لە زاناکان ئەم ئایەتە دەکەنە بەڵگەی حەرامیەتی (عەزڵ)و ڕێگرتن لە زگبوون، بەڵام تاقمێ تر درێژەیەکی دەدەنێ و دەڵێن لەبەر چەند هۆیەك حەڵاڵە..!. ﴿**نحن نرزقکم وإیاهم**﴾ چونکە هەر ئێمەین ڕسق و ڕۆزی بە ئێوەو، بە وانیش ئەدەین. ﴿**ولا تقربوا الفواحش ماظهر منها وما بطن**﴾ چوارەم: بە ئاشکراو بە نهێنی توخنی تاوان وکارە درێوەکان - ئاشکراو نهێنییان - مەکەون ، واتە: نزیکی هیچ جۆرە گوناهێ: گەورەو بچووك, ئاشکراو نهێنی- مەکەونەوە ﴿**ولا تقتلوا النفس التی حرم الله إلا بالحق**﴾ پێنجەم: کەسێکیش مەکوژن ، خوا کوشتنی بەهەق نەبێ یاساغ نە کردووە، واتە ئێوە بەهەق نەبێ مەردوم مەکوژن، پەیامبەرمانﷺ چەندە جوان ڕاڤەی ئەو هەق و ناهەقەی کردووە بەم فەرموودەیە:((لا یحل دم امرئ إلا بإحدی ثلاث: الثیب الزانی، والنفس بالنفس، والتارك لدینه المفارق للجماعة)) بوخاریی وموسلیم ﴿**ذلکم وصاکم به**﴾ خوای گەورە بۆخۆی ئەمانەی بە ئێوە ڕاسپاردووە ﴿**لعلکم تعقلون**﴾ بە شکوم بیر بکەنەوەو وریاو ژیربن، چاك و خراپ، هەق و ناهەق لەیەك بکەنەوە ﴿[١٥٢] **ولا تقربوا مال الیتیم إلا بالتی هی أحسن**﴾ شەشەم: هەرگیز نزیکی ماڵ و دارایی هەتیوانان مەکەونەوە بە شێوەیەکی چاك وجوان نەبێ ﴿**حتی یبلغ اشده**﴾ تا بۆ خۆی دەگاتە حاڵەتی پر هێزیی و توانایی خۆی و، باڵغ و کامڵ ئەبێت، ئەوسا ئیتر ئەگەر لەژێر دەستی ئێوەشدا بوو، بیدەنەوە دەستی خۆی. ﴿**وأوفوا الکیل والمیزان بالقسط**﴾ حەوتەم: با پێوانەو کیشانەتان دادگەرانە بێ، واتە: مامەڵەتان ڕێك وپێك و، دوور لە گزیی و خیانەت بێت ﴿**لا نکلف نفسا إلا وسعها**﴾ خۆ ئێمەش لەتوانا بەدەر، تەکلیف و داوا لە هیچ کەسێك ناکەین بوعەدالەت ودادگەریی. ﴿**وإذا قلتم فاعدلوا ولو کان ذاقربی**﴾ هەشتەم: هەرکە قسەیەکتان کرد، یان

الجزء الثامن | سورة الأنعام

وَلَا تَقۡرَبُواْ مَالَ ٱلۡيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ حَتَّىٰ يَبۡلُغَ أَشُدَّهُۥۖ
وَأَوۡفُواْ ٱلۡكَيۡلَ وَٱلۡمِيزَانَ بِٱلۡقِسۡطِۖ لَا نُكَلِّفُ نَفۡسًا إِلَّا
وُسۡعَهَاۖ وَإِذَا قُلۡتُمۡ فَٱعۡدِلُواْ وَلَوۡ كَانَ ذَا قُرۡبَىٰۖ وَبِعَهۡدِ
ٱللَّهِ أَوۡفُواْۚ ذَٰلِكُمۡ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ﴿١٥٢﴾
وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمٗا فَٱتَّبِعُوهُۖ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ
فَتَفَرَّقَ بِكُمۡ عَن سَبِيلِهِۦۚ ذَٰلِكُمۡ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمۡ
تَتَّقُونَ ﴿١٥٣﴾ ثُمَّ ءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡكِتَٰبَ تَمَامًا عَلَى ٱلَّذِيٓ
أَحۡسَنَ وَتَفۡصِيلٗا لِّكُلِّ شَيۡءٖ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٗ لَّعَلَّهُم بِلِقَآءِ
رَبِّهِمۡ يُؤۡمِنُونَ ﴿١٥٤﴾ وَهَٰذَا كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ مُبَارَكٞ فَٱتَّبِعُوهُ
وَٱتَّقُواْ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ﴿١٥٥﴾ أَن تَقُولُوٓاْ إِنَّمَآ أُنزِلَ ٱلۡكِتَٰبُ
عَلَىٰ طَآئِفَتَيۡنِ مِن قَبۡلِنَا وَإِن كُنَّا عَن دِرَاسَتِهِمۡ لَغَٰفِلِينَ
﴿١٥٦﴾ أَوۡ تَقُولُواْ لَوۡ أَنَّآ أُنزِلَ عَلَيۡنَا ٱلۡكِتَٰبُ لَكُنَّآ أَهۡدَىٰ مِنۡهُمۡۚ
فَقَدۡ جَآءَكُم بَيِّنَةٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٞۚ فَمَنۡ
أَظۡلَمُ مِمَّن كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَصَدَفَ عَنۡهَاۗ سَنَجۡزِي ٱلَّذِينَ
يَصۡدِفُونَ عَنۡ ءَايَٰتِنَا سُوٓءَ ٱلۡعَذَابِ بِمَا كَانُواْ يَصۡدِفُونَ ﴿١٥٧﴾

١٤٩

بڕیارێکتانـدا، دەبـێ دادگـەربن تێیـدا، ئەگەرچـی ئـەو بڕیـارە دژی خزمـانی نزیکـی خۆشـتان بـێ. ﴿وبعهـد الله اوفـوا﴾ .نوێـەم: دەبـێ بەرامبـەر بەپـەیمان و ئامۆژگارییـەکانی خـوا بـە ئەمـەك و بـەوەفا بـن، واتـە: هـەر مامەڵـەو ڕێکەوتنامەیـەکتان هـەبوو، بـەجوانی جێبـەجێی بکـەن و، لەبـەر ئـەم وئـەو، قورئـان وفـەرموودەکان پشتگوێ مەخـەن ﴿ذلکم وصاکم به﴾ خوا ئەمانەی بەئێوە ڕاسپاردووەو ئامۆژگاریی و، وەسیەتی پێکردوون، دەسا ئاگاتان لەخۆتان بێت ﴿لعلکم تذکرون﴾ بەڵکو هەر لەبیرتان بن و ئامۆژگارییان پێوەرگرن.

**تەنیا لە ڕێبازی ئیسلام پەیڕەوی بکەن:**

(ئیبن مەسعود) ئەڵێت: پەیامبەرﷺ ڕۆژێ هێڵێکی ڕاستی کێشا، پاشان فەرمووی: ئەم هێڵە ڕاستە نموونـەی ڕێگاو ڕێبازیی خوایە، ئینجا چەند هێڵێکی تری بەڕاست و چەپدا کێشاو، فەرمووی: ئەمانـەش نموونـەی لاڕێ و کوێرە ڕێگاکانە، چاکیش بزانن لەسەر هەر یەك لەوکوێرە ڕێگانە شەیتانێك لە ئادەمیی وەستاوەو، خەڵکیی بۆ بانگ دەکـات ، ئینجا گـوتی مەبەسـت ئەمەیـە کـەخوا ئەفـەرموێ: ﴿١٥٣ وان هـذا صـراطی مستقیما فـاتبعوه﴾ ئـەم هێڵـە ڕاستەیە بەرنامەو ڕێبازەکەی منە ، دەسا ئێوەیش ئەی ئیمانداران ! هەمیشە شوێنی بکەون و هەر بەودا بچن. ﴿ولا تتبعوا السبل فتفرق بکم عن سبیله﴾ دەیەمی دەسپاردەکە خوا ئەفەرموێ: مەکەونە شوێنی ڕێچکەکانی تر، ئەوسا لە شاڕێگەکەی خوا بترازێن و پەڕاگەندە ببن ﴿ذلکم وصاکم به لعلکم تتقون﴾ ئەوانە گشت وەسیەت و ڕاسپاردەو ئامۆژگاری خوان ، دەسا بەڵکو ئێوەیش بیانپارێزن وسنووورشکێنی نەکەن ﴿١٥٤ ثم آتینا موسی الکتاب تماما علی الذی احسن﴾ لەپاشان (تەورات)مان دا بەموسا، لەبەر تەواو کردنی چاکەو نیعمەتی خۆمان لەسەر ئەوەچاکەکار بوو لە ئوممەتی مووسا ﴿و تفصیلا لکل شئ﴾ وە ڕوونکەرەوەش بۆ هەمووشتێك، بەتایبـەتی هەرشتێ ئـەوان نیازمەند بوون پێی ﴿و هدی و رحمة﴾ بە ڕێنمایی و ڕەحمەت و بەزەیی بۆتان، تابتوانن لەڕێگە چەوتەکان خۆتانی پێ ڕزگار بکـەن ﴿لعلهم بلقـاء ربهـم یؤمنـون﴾ بەشـکو بەدیـدارو لیقـای پەروەردگاریشـیان لـە دواڕۆژدا بـاوەڕ بکـەن، ئـەوجا لەگوناح بگەڕێنـەوە ﴿١٥٥ وهـذا کتـاب انزلنـاه مبارك﴾ ئـەم قورئانـەش ناردمانـە خـوارێ کتێبێکـی پیرۆز و پڕ پیتـە ﴿فاتبعوه واتقوا لعلکم ترحمون﴾ دەسـا گشـتان پـەیڕەوی لێبکـەن و، بیکـەنـە پێشـەوای خۆتـان، و لـە خـواش خۆ بپارێزن، بەشکو لەهەردوولا میهرەبانیتان لەگەڵ بکاو، سزا نەدرێن .

**قورئان بەڵگەیە بەسەرتانەوە:**

﴿١٥٦ ان تقولوا إنما أنزل الکتاب علی طائفتین من قبلنا﴾ ئەم قورئانەمان نـارد بۆئـەوە ئێـوە نـەڵێن: نامـەو کتێب تەنها بۆ دووکۆمەڵ ودوو دەستەی بەر لە خۆمان (واتە:جوولەکە وگاور) دابەزێنراوەو، ئێمە بـێ نامـەو کتێبین ﴿وان کنا عن دراستهم لغافلین﴾ و بە ڕاستی ئێمە لە خوێندنەوەی کتێبەکانیان ئاگادار نەبووین ﴿١٥٧ او تقولوا لو انا انزل علینا الکتاب لکنا أهدی منهم﴾ هـەتا نەشڵێن: ئەگـەر ئێمـەش وەکـو ئـەوان نامـەمان بۆ هاتبـا، لەوانباشتر شارەزا دەبووین وڕێمان دەردەکرد ﴿فقد جاءکم بینة من ربکم وهدی ورحمة﴾ دەوا ئێستا لـە لایـەن پەروەردگارتانەوە بەڵگەو نیشانەیەکی ڕوون و، ڕێنمایی و بەزەییەکتان بۆهات ، ئیتر هیچ بروبیانوویەکتان نەما ﴿فمن أظلم ممن کذب بآیات الله﴾ جـادەبێ چ کەسێك لەوکەسـە سـتەمکارتربێ، کـەپاش ئەوکتێبـە بـڕوای بـە ئایەتـەکانی خـوا نـەبێ و بەدرۆیان بزانێ ﴿وصدف عنها﴾ و ڕوویان لێوەرگێڕێ؟! ﴿سنجزی الذین یصدفون عن آیاتنا سوء العذاب بماکانوا یصـدفون﴾ دڵنیـابن بـەزوویی سـزایەکی زۆرخراپـی ئەوکەسـانە دەدەیـن، ڕوو لەئایەتـەکانمان وەرئـەگێڕن، هـەر لەبەرئەوکارە کردیان.

### بۆچی هەر ئەمرۆو سبەینێ دەکەن لەئیمان و تەوبەدا؟:

﴿[١٥٨] هل ينظرون إلا أن تأتيهم الملائكة﴾ ئا خۆ ئەوانە کە تەوبە ناکەن و ناگەڕێنەوە لای خوا، تەنیا چاوەڕوانی ئەمەناکەن کتوپڕ فریشتەی گیانکێشان بێتە لایان وگیانیان بکێشێ؟ ﴿أو يأتي ربك﴾ یان پەروەردگارت لە وێستگەی قیامەتدا بێتە لایان بۆ داوەریی نێوانیان ؟ ﴿أو يأتي بعض آيات ربك﴾ یان نیشانەکانی پەروەردگارت بڕێکیان – بەرلە هاتنی ڕۆژی دوایی وەك خۆر هەڵاتن لە خۆرئاواوە- بێن وسەرهەڵبدەن و، دەرگای تەوبەیان لێدا بخرێت ﴿يوم يأتي بعض آيات ربك﴾ خۆ ئەو ڕۆژە کە هێندێکی نیشانەکانی پەروەردگارت دێن وسەرهەڵدەدەن ﴿لا ينفع نفسا إيمانها لم تكن آمنت من قبل﴾ ئیترهەر کەسێك بەرلەوە باوەڕی نەهێنابێ و، ئەوڕۆژە باوەڕ بهێنێ، هیچ قازانجێکی لێناکات ﴿أو كسبت في إيمانها خيرا﴾ یان بییەوێ لەوماوەیەدا چاکەیەك بەدەست بهێنێ، هەمیسان بێسوود دەبێت، کەوابوو بەرلەو ڕۆژە باوەڕ بهێنن و، کارێکی باشیش وە دەست بخەن بۆخۆتان ﴿قل انتظروا﴾ بڵێ: دەسا ئێوە چاوەڕوان بن هەتا ئەوڕۆژە دێت، جا خۆتان دەبیننەوە ﴿إنا منتظرون﴾ ئەوا ئێمەش بۆ خۆمان چاوەڕوانین.

### دینەکەتان پەرژو بڵاو مەکەن ولێك مەترازێن:

﴿[١٥٩] إن الذين فرقوا دينهم﴾ بێگومان ئەوکەسانەی دینی خۆیانیان پەرت و بڵاوکرد ﴿و كانوا شيعا لست منهم في شئ﴾ و بوونە چەند دەستەو بەستەیەکی جیاوازو لێکترازاو، تۆ کارێکت بەوان نییە ﴿إنما امرهم إلى الله﴾ بەڕاستیی بڕیاری چارەنووسیان هەرلای خوایە، ئەو خۆی چاك دەزانێ جەزرەبەو تۆڵەیان چۆن بدات ﴿ثم ينبئهم بما كانوا يفعلون﴾ پاشانیش بە هەرکارێ کردوویانە ئاگاداریان دەکات. ئەم ئایەتی:(إن الذين فرقوا دينهم وكانوا شيعا لست منهم في شيء..) ئەگەرچی لەبنەڕەتدا ڕووی لە(یەهوودو نەصارا)یە و ، ئەوان بوون ئایینی خۆیانیان پەرتکردو هەڵوەشاندەوە، بەڵام ئێستا هەموو موسڵمانانی دنیا دەگرێتەوە، ئەوانەیان لەقازانجی ئەم دینی ئیسلامە کارناکەن و، دەستەدەستە لێیوەستاون ﴿[١٦٠] من جاء بالحسنة فله عشر امثالها﴾ هەرکەسێك لەم دونیایەدا چاکەیەك بکا، لەڕۆژی قیامەتدا دەبەرامبەر چاکەی لەگەڵ دەکرێتەوە ﴿ومن جاء بالسيئة فلا يجزى إلا مثلها﴾ هەرکەسێکیش خراپەیەبکا، تەنها بەئەندازەی ئەوخراپەیە تۆڵە وجەزرەبە ئەدرێ، واتە: زیاد لە تاوانەکەی خۆی تۆڵە نادرێ بەسەریا وەکو دەفەرموێ: ﴿وهم لا يظلمون﴾ بەهیچ شێوەیەکیش ستەم لەهیچ کەسێکیان ناکرێت.

الجُزءُ الثَّامِن — سُورَةُ الأَنعَام

هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن تَأْتِيَهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَوْ يَأْتِىَ رَبُّكَ أَوْ يَأْتِىَ
بَعْضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ ۗ يَوْمَ يَأْتِى بَعْضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ لَا يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَٰنُهَا
لَمْ تَكُنْ ءَامَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِىٓ إِيمَٰنِهَا خَيْرًا ۗ قُلِ ٱنتَظِرُوٓا۟
إِنَّا مُنتَظِرُونَ ﴿١٥٨﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُوا۟ دِينَهُمْ وَكَانُوا۟ شِيَعًا لَّسْتَ
مِنْهُمْ فِى شَىْءٍ ۚ إِنَّمَآ أَمْرُهُمْ إِلَى ٱللَّهِ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ
﴿١٥٩﴾ مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشْرُ أَمْثَالِهَا ۖ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ
فَلَا يُجْزَىٰٓ إِلَّا مِثْلَهَا وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿١٦٠﴾ قُلْ إِنَّنِى هَدَىٰنِى رَبِّىٓ
إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ دِينًا قِيَمًا مِّلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا ۚ وَمَا كَانَ مِنَ
ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٦١﴾ قُلْ إِنَّ صَلَاتِى وَنُسُكِى وَمَحْيَاىَ وَمَمَاتِى لِلَّهِ
رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦٢﴾ لَا شَرِيكَ لَهُۥ ۖ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُسْلِمِينَ
﴿١٦٣﴾ قُلْ أَغَيْرَ ٱللَّهِ أَبْغِى رَبًّا وَهُوَ رَبُّ كُلِّ شَىْءٍ ۚ وَلَا تَكْسِبُ كُلُّ
نَفْسٍ إِلَّا عَلَيْهَا ۚ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۚ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم مَّرْجِعُكُمْ
فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿١٦٤﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَكُمْ
خَلَٰٓئِفَ ٱلْأَرْضِ وَرَفَعَ بَعْضَكُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَٰتٍ لِّيَبْلُوَكُمْ
فِى مَآ ءَاتَىٰكُمْ ۗ إِنَّ رَبَّكَ سَرِيعُ ٱلْعِقَابِ وَإِنَّهُۥ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌۢ ﴿١٦٥﴾

١٥٠

**هەرئیسلامە راستە رێگە:**

﴿١٦١ قل إننی هدانی ربی إلی صراط مستقیم﴾ ئەی پێغەمبەر! بڵێ: بەڕاستیی پەروەردگارم رێنمایی کردوم بۆ رێگەیەکی ڕاست ﴿دینا قیما ملة إبراهیم حنیفا﴾ رێنماییکردوم بۆ دین و ئاینیکی زۆر ڕاست و پایەدار، ئایینی پاکی (ئیبراهیم)، کە رووی لە هەر لارێ و نارەوایەك وەرچەرخاندبووو، تەنهاو تەنها رووی لە خوا بوو ﴿وما کان من المشرکین﴾ تەنها ساتێکیش لە هاوبەشدانەران نەبوو ﴿١٦٢ قل إن صلاتی ونسکی ومحیای ومماتی﴾ دیسان بڵێ: بە ڕاستی نوێژ وحەج و قوربانیی و ژیان ومردنم ﴿لله رب العالمین﴾ گشت هەر بۆ خوای پەروەردگاری جیهانەکانە ﴿١٦٣ لا شریك له﴾ کە هیچ هاوەڵێکی بۆ نییە ﴿وبذلك أمرت﴾ هەر بەوەش فەرمانم پێدراوە، دەبێ هەربۆخوا بژییم وبمرم ﴿وانا اول المسلمین﴾ دیارە کەیەکەم کەسیشم لەڕیزی موسڵمانانی ئەم ئوممەتەدا.

**بەدەر لەخوا کەس بە پەروەرێن مەزانە:**

﴿١٦٤ قل اغیر الله ابغی ربا﴾ هەمیسان بڵێ: ئایا بۆ من دەبێ جگە لە خوا کەسێکی تر بە پەروەردگاری خۆم بخوازم، واتە: بیکەمە گەورەی خۆم؟ دیارە قەت شتی وا نابێ ﴿وهو رب کل شئ﴾ خۆ هەرئەویشە پەروەردگاری هەموو شتێك ﴿ولا تکسب کل نفس إلا علیها﴾ وهەرکەسێك هەر کارێکی خراپ بکا بەزیانی خۆی تەواو دەبێ ﴿ولا تزر وازرة وزر اخری﴾ و هیچ کەسێك باری گوناهی هیچ کەسێکی تر هەڵناگرێ. ئەم ئایەتە وەڵامە بۆ (وەلید) و وێنەی ئەوکە دەیگوت: وەرن لەمن پەیڕەوی بکەن، ئەوسا منیش گوناحتان هەڵدەگرم!. (ئیبن عەباس) ئەمەی گێڕاوەتەوە. هەندێکی دی ئەڵێن: لەسەردەمی جاهیلیەتدا باب لەباتی کوڕ، کوڕ لەباتی باب، خزمی نزیك لەباتی خزم سزا دەدرا ! ئەوجا ئەوئایەتە هات بۆ راستکردنەوەی ئەو هەڵەیە، بەڵام (قورتوبیی) دەڵێ: ئەمە کە: کەس گوناحی کەس هەڵناگرێ تەنها بۆ ڕۆژی قیامەتە. ﴿ثم إلی ربکم مرجعکم﴾ پاشان هەر بۆلای پەروەردگارتان دەگەڕێنەوە ﴿فینبئکم بما کنتم فیه تختلفون﴾ ئینجا لەوشتانە ناکۆکبوون وهەراتان بوولەسەریان ئاگادارتاندەکاو، لەراستییەکان تێتان دەگەیەنێت ﴿١٦٥ وهو الذی جعلکم خلائف الأرض﴾ هەر ئەویشە ئێوەی کردە جێنشینی یەکتریی لەسەر رووی ئەم زەوییەدا، واتە: دەتانهێنێ بەدوای یەکتردا ﴿ورفع بعضکم فوق بعض درجات﴾ هەندێکتانی بەچەند پلەیەك سەرخست بەسەر هەندێکیتردا، لەبوون ولەنەبووندا، بۆیە هەیە پاشاودارایە، هەیە گەداونەدارە ﴿لیبلوکم فیما آتاکم﴾ تا تاقیتان بکاتەوە لەوەدا پێیداون ، واتە: هەتاخۆتان وخەڵکانی تریش بزانن ئاخۆ شوکرانە بژێر دەبن یا نە؟ ﴿إن ربك سریع العقاب﴾ بێگومانبە پەروەردگارت زوو بە پەلە تۆڵە دەستێنێ لەیاخییان ﴿وإنه لغفور رحیم﴾ و لەتاوان و گوناح دەبوورێ و، زۆریش پۆشەرو دڵاوایە. پێغەمبەریشمان "موحەممەد" لەوبارەوە دەفەرموێ: ئەگەر موسڵمان زانیبای خوای گەورە چ تۆڵە و جەزرەبەیەکی هەیە، هەرگیز بەتەمای بەهەشت نەدەبوو، کافریش ئەگەر زانیبای ڕەحمەت و بەزەیی خوا چەندە فراوانە، هەرگیز لەبەهەشت بێ هیوا نەدەبوو، چونکە خوای دلۆڤان ڕەحم وبەزەیی خۆی کردووە بەسەد بەشەوە، تەنها بەشێکی خستۆتە سەر رووی ئەم زەوییە، ئەو میهرەبانیی و سۆزو خۆشەویستییە گشت لەوەوە هەڵقوڵیوە.

لەکۆتاییدا سوپاسی بێکۆتایی بۆ پەروەرندەی خاوەن دەهندەی بەبەزەیی کە: شارەزاو رێنمایکردم بۆ نووسینی ئەم کورتە تەفسیرەی سوورەتی (ئەنعام). ولله الحمد والمنة.

*** *** ***

## ٧- سوورەتی( ئەعراف )ـە

## مەککەیی یەو ( ٢٠٦ ) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئـەم سـوورەتە یەکێکـە لـە سـوورەتە درێـژەکانی (مەککـە)ـەو، یەکـەم سـوورەتیشـە بـەو شـێوە درێژەیـە هـەواڵ وداستانی پەیامبەران – علیهم السلام– باس دەکات، جائەوی لێرەدا زۆر گرنگ و مەبەست بێت، هەروەك لـە گشت سـوورەتەکانی تـری مەککەشـدا هەروایـە, بریتییـە لـە بناغـەو بنـەما سـەرەکییەکانی دینـی ئیسـلام, وەکـو: (یەکخواپەرستیی، زیندوو بوونەوەو پاداشت و تۆڵە، سروش و وەحیی و پەیامەکەی پێغەمبەر). باسی گـەورەیی ومەزنی قورئان دەکات کە چۆن بۆتـە موجیزەیـەکی زۆر گرنگـی هـەتا هـەتایی، چۆن بۆتـە بەهرەو خەڵاتێکی خوای دلۆڤان بەسەر مرۆڤەکانەوە .. کەوابوو دەبێ بە توندیش دەستی پێوە بگرن و، هەرگیز لێیدوور نەکەونەوە.. بۆ ئەوە لەهەردوولا بە ختیاربن. ئەوەیان بیر ئەخاتەوە کەهەموو لـە یەکباب (ئادەم) دروستکراون و، وەبیریان دێنـێ چۆن ڕێزی لێناون و فەرمانی بە فریشتەکان کردووە سوژدەو کڕنووشی بۆ بەرن، لە پاشا هوشیاریان دەکاتـەوە لە فێڵ و فەرەجی (شەیتان) کە: چەندە دوژمنێکی سەرسەختە بۆیان، هەر لە (ئادەم)ـەوە هەتا (خاتـەم) و، بگرە تا دونیا دونیاش بێت، دەسا دەبێ ئێوەیش بە دوژمنی ئاشکرای خۆتانی بزانن. داستانی باوە(ئادەم) و(شەیتان) هەر لە سەرەتایەوە هەتا دەرچوونی لە بەهەشت و، هاتنە خوارەوەی بۆ سەرزەویی باس دەکات کە: هەرهـەمووی مانای ململانێی هەقە لە گەڵ ناهەق، چاکەیە لەگەڵ خراپە، هـەتا دونیا کۆتـایی دێت. هـەر بۆیـە خوایش لـەم سوورەتەدا چوار جار بەڕستەی :(یا بنی آدم، یابنی آدم)! مرۆڤ هۆشیار دەکاتـەوە لەسـەر دوژمنایـەتی شـەیتان، هـەتا ڕۆژی دوایـی . دیمـەنی هەرسـێ تـاقم ودەسـتەکەو گفتوگـۆی نێوانیـان: موسـڵمانەکانی یـارانی بەهەشـت، بـێ بڕواکـان وهاوڕێیـانی دۆزەخ، هـاوەڵان ویـارانی ئـەعراف، بـاس دەکـات.. خۆشحاڵی بەهەشتییەکان و، بەدبـەختیی و خـەم و پـەژارەی دۆزەخییـەکان و، تۆمـارکردنی نـەفرین و دوور بوونیـان لـە میهرەبـانیی و سـۆزی خـوای میهرەبـان بەرامبەریان.. ئینجا لە نێوان هەردووکیاندا(شوورە)یەك دادەنرێ و کۆمـەڵی موسڵمانانی لە سەر ڕادەوەستن، هـەر دوولایـان دەناسـن، بەهەشـتییەکان بـە ڕوویگـەش و سـپیی و پرشـنگداریانەوە، دۆزەخییـەکانیش بـە ڕووی ڕەش و گـرژو نالەباریانـەوە. کـەمێك بـە درێـژەیش باسـی داسـتانەکەی (نـووح) و(هـوود) و(صـالح) و (لـووط)و (شـوعەیب)و (موسا)–علیهم الصلاة والسلام– دەکات.. لە سەرەتاوە بە پیری پەیامبەران (نووح) عليه السلام دەست پێ دەکات.. ئەو هـەموو ئازارو عەزیەت و ئەمبەرو ئەو بەرەی پێیانکرد لە سەر بەرنامەکەی خواو، ئەویش چۆن بەجوامێرانە ئارامیگرت و خۆی بە دەسـتەوە نـەدا. داسـتانەکەی (موسـا) و(فیرعـەون) و ئـەو هـەموو ململانێیـە لەگـەڵ موسـادا عليه السلام کردیـی و دەرەنجـام ئـەو هـەموو بـەڵاو نەهامەتییـە ڕوویکـردە جوولەکـەکان، بـە هـۆی سەرپێچییانەوە لەموسـا عليه السلام. ئینجـا خراپترین نەزیلەو نموونە دێنێتەوە بۆ زانا خراپکارەکانی جوولەکە" ئەوانـەیان وا دوای ڕاستیی و هـەق نەکـەوتن و خۆیان کردە کۆمـەککاری ئـەم و ئـەو"..نموونـەیان بـە وێنـەی سـەگێك دەهێنێتـەوە کـە هـەردەم زمانـە ملاسـێ بکـاو، زمانی بە قوڕدا بێنی و، هەرگیز ئیسراحەت لەخۆی نەبینێ..وەکو دەفەرموێ: (ولو شئنا لرفعناه بها ولکنه أخلد إلی الأرض واتبع هواه فمثله کمثل الکلب إن تحمل علیه یلهث أو تترکه یلهث). بۆیـە ئەونموونەیانـە بۆدێنێتـەوە هـەتا هـەموو کەسێك بزانێت کەهـەر زانایـەك زانستەکەی لـە جێگـەی خۆیدا بـەکار نـەهێناو، بـەڵکو کردییـە هۆکـاری خـۆ ژیانـدن و هـەر ڕۆژەی لـە دەرگایەکیدا بۆ پاروویـە نـان!! ئـەوە بـا حیسابێك بـۆ خـۆی بکـات، چونکـە خـوا زۆر لێـی

بێـزارەو، بەتـەواوی ئـابڕووی خێـزان و خانـەوادەی زانایـانی بـردووە. سـوورەتەکە لەکۆتاییـدا بـە سـەلماندنی یەکتاپەرستیی دەرگا لـەخۆی دادەخـاو، بەتوندی دائەبەزێتـە سەر ئەوانـە کەجگـە لـە خوا ئەم و ئەو دەکەنـە خوای خۆیان ، واتە: فەرمانیان پێدەکەن" دارو بەرد، پاشاو سەرۆك، کوڕ، ژن ومالْ، هەواو ئارەزوودەپەرستن".لەگەورەیی ئـەم سـوورەتەدایە کـە پێغەمبـەر ﷺ لەنوێـژی شـێواندا لـە هـەردوو رکاتەکـەدا سـوورەتی (ئـەعراف)ی خوێنـد/ وەکونەسـایی دەگێڕێتـەوە ودەڵێت: (عن عائشة أن رسول الله ﷺ قرأ فی صلاة المغرب بسورة (الأعراف)، فرقها رکعتین) إسنادە صحیح. بەم شێوەیەش دەست پیْ دەکا ودەفەرموێ:﴿بسم الله الرحمن الرحیم * [1] المص﴾ ئەم پیتانەش ، وەك لەپێشەوە باسمانکرد، هێماو ئاماژەن بۆ ئیعجازو ڕەوانبێژیی قورئان، هـەروەك (تەحـەددی)یە بۆ عەرەبە بیْ باوەڕەکان وپێیان دەڵێ : ئەگـەر گومانێکتان لـەم قورئانـەدا هەیـە، دەسا فـەرموون تـەنیا سـوورەتێك وەك ئـەو بێـنن ﴿[2] کتاب انزل إلیك﴾ ئەمـە کتێب ونامەیەکە، لەلایـەن خـواوە دابـەزێنراوە بـۆت ئـەی موحەممـەد! ﷺ ﴿فلایکن فی صدرك حرج منه﴾ نابیْ لە بەر قسەی ناپاکان خۆت دڵتـەنگ بکـەیت ﴿لتنـذر بـه﴾ بۆتهات هـەتا خـەڵکی بێبـاوەڕیی پـیْ بترسـێنی ﴿وذکـری للمـؤمنین﴾ وبشـبێتە ئامۆژگـاریی و، یاداوەریی بۆ کۆمەڵی بڕواداران، چونکە بە تەنها ئەوانن وەك پێویست قازانج و کەڵکی لێوەر دەگرن ﴿[3] اتبعوا ما انزل إلیکم من ربکم﴾ خەڵکینە! هەرچی لەلایەن پەروەردگارتانەوە دابـەزێنراوە بۆتـان، پـەیڕەوی بکـەن ﴿ولا تتبعـوا مـن دونـه أولیـاء﴾ بێجگـە لـەو مەکەونـە شـوێنی سەرپەرستیاروکاربەدەستانی تر﴿قلیلا ما تذکرون﴾ ئێوە زۆر کەم بیردەکەنەوەو ئامۆژگاری وەرئەگرن!.



### هەواڵی شارو گوندە قڕکراوەکان :

﴿[4] وکم من قریة اهلکناها﴾ گونـدو شـارو ئاواییـەکی زۆرمـان –لەوانـەی سەرپێچیان کـرد– لـەناو بـرد ﴿فجاءها بأسنا بیاتا﴾ بەوشێوە کە هەر لەناو جەرگەی شەودا سزای ئێمەیان بۆهات ﴿او هم قائلون﴾ یان لەکاتی (قەیلوولە)و حەوانەوەی نیوەڕۆدا بوون ، واتە: لە کاتی پشوودان و حەوانەوەو رابواردن و خەفڵەتا، کتوپڕ گرتمانن ﴿[5] فما کان دعواهم إذ جاءهم بأسنا﴾ کەسزاکەمان بۆیانهات ، قسەو هاوارێکیان نەما ﴿إلا ان قالوا إنا کنا ظالمین﴾ ئەمە نـەبێت کەددانیان بـەتاوان وگونـاحی خۆیانـدا نـاو گوتیـان: بێگومـان ئێمـە خۆمـان ستەمکار بـووین و، فـەرمانی خوامـان شکاند، بۆیە وا ئێستا ئەوەمان بەسەرهات ﴿[6] فلنسألن الذین أرسل إلیهم﴾ دڵنیابن لەو کەسانە پەیامبەرانیان بۆ هاتووە دەپرسینەوەو دەڵێین: ئاخۆ کاتیْ بەرنامەی خواتان پیْ ڕاگەیەنرا لەلایەن پێغەمبەرانەوە، وەڵامتـان چی بوو بۆیـان؟ لـە جێگایـەکی تریشـدا ئەفـەرمویْ : (ثـم إن علینـا حسـابهم)٢٦/٨٨" ﴿ولنسـألن المرسـلین﴾ وە لـە پێغەمبـەرەکانیش دەپرسـین : ئـەریْ بەرنامەکـەی خواتـان گەیانـد..؟ ﴿[7] فلنقصـن علیهم بعلم﴾ ئینجا بە ڕاستیی

سەرلەبەر چیپانکردووە بیّ زیادو کەم وەك خۆی بۆیان ئەگێڕینەوە و، لە نامەی کاروکردارییاندا بۆیان دەهێنریّ ﴿وما كنا غائبين﴾ قەتیش ئێمە لێیان بیّ ئاگاو نادیار نەبوین، هە تا نەزانین چیانکردووە. (ئیبن کەسیر) ئەڵێت: گەورەو بچووك و، وردو درشتیان پیّ دەڵێن ﴿[8] والوزن يومئذ الحق﴾ وە کێشانەو لێکدانەوەی کاروکردەوەی گشت ئەوخەڵکانە، لەو ڕۆژی قیامەتەدا بەڕاستیی و دادگەرانە دێتە پێش و، ستەم لەهیچ کەسێش ناکرێت ﴿فمن ثقلت موازينه﴾ ئینجا هەر کەسێك تای تەرازووی کردەوەکانی گران و قورس بێت لای‌خوا، واتە: کاروکردەوەی دنیای چاك بێت ﴿فأولئك هم المفلحون﴾ دیارە هەر ئەوانە بەختیار و سەرکەوتوو سەرفرازن ﴿[9] ومن خفت موازينه﴾ کەسێکیش کە تای تەرازووی کاروکرداری سووك وبیّ بەهابوو، واتە:خوانەناس بوو ﴿فأولئك الذين خسروا انفسهم﴾ ئەوانەش، ئەوانەن کە زیانیان بە خۆ گەیاندوخۆیان فەوتاند ﴿بما كانوا بآياتنا يظلمون﴾ چونکە لەبەرامبەر ئایەت و نیشانەکانی ئێمەوە ستەمیان کردو، ڕوویان لێوەرگێڕان، جا ئێستاش خۆمان ئەزانین چیان پیّ ئەکەین.

## لەزەویی بژێویمان پێداون:

﴿[10] ولقد مكناكم في الأرض﴾ سوێند ئەخۆم ئێمە، ئێوەمان ئەی ئادەمزاد! لەم زەوییەدا دامەزراندو نیشتەجێکرد ﴿وجعلنا لكم فيها معايش﴾ وەهۆی ژیان و ژیواریشمان تێیدا سازدا بۆتان، ئەوەندە پێی بژین ﴿قليلا ما تشكرون﴾ کەچی زۆر کەمتان شوکرانە بژێریی و سوپاسم دەکەن!.

## فریشتە سوژدە دەباو ، ئیبلیس یاخی دەبیّ:

﴿[11] ولقد خلقناكم﴾ سوێند بە خوا ئێوەمان (باوکەئادەم) لە قوڕ دروستکرد ﴿ثم صورناكم﴾ پاشان بەو شکڵە جوانەیە وێنەو نیگارتانمان کێشا ﴿ثم قلنا للملائكة اسجدوا لآدم﴾ پاشان بە فریشتەکانمان وت: گشتتان کڕنووشی ڕێز بۆ ئادەم بەرن ﴿فسجدوا إلا إبليس لم يكن من الساجدين﴾ هەموو ئەوانیش کڕنووشیان برد، شەیتان نەبێت، ئەو لە ڕیزی کڕنووشبەران خۆی هەڵاوارد، چونکە دەعیەو فیزوو خۆ بەزلزانین نەیهێشت ﴿[12] قال ما منعك الا تسجد إذ امرتك﴾ خوا فەرمووی: باشە! من کەفەرمانم پێدای سوژدە بەریت بۆ ئادەم، چ شتێك ڕێی لێگرتیت "ئەی شەیتان" کڕنووش نەبەیت ؟

**تێبینی یەك:** زانا (نەحوو) زانەکان هەندێکیان دەڵێن: (لا: هنا زائدة، زيدت لتأكيد الجحد). (ئیبن جەریر)یش دەڵیّ: (إن ((ما منعك)) مضمن معنى فعل آخر تقديره: ما ألزمك واضطرك أن لا تسجد إذ أمرتك). (ئیبن کەسیر) دەڵیّ: (وهذا القول قوى حسن. والله أعلم). ﴿قال انا خير منه﴾ وتی:لەبەر ئەوە کە من لەو چاکترو بەڕێزترم، چۆن دەبیّ (فاضل) سوژدە بۆ (مەفضول) بەرێت ﴿خلقتني من نار﴾ تۆ منت لە ئاگر دروستکرد ﴿وخلقته من طين﴾ و ئەویشت لە قوڕ دروستکرد، لە بەر ئەوە سوژدە نابەم ﴿[13] قال فاهبط منها﴾ خوا فەرمووی: دەسا لەو پلە تە – بەهەشت، یان (ملكوت الأعلى) – وەرەخواریّ ﴿فما يكون لك ان تتكبر فيها﴾ تۆ بۆت نییە بەسەر کەسدا فیز بکەیت لەم شوێنەدا. زۆربەی تەفسیر کارانی قورئان دەڵێن: ڕاناوی (منها) لەم جێگایەدا بۆ بەهەشت دەچێتەوە، بەڵام هەندێکیان دەڵێن: بۆ ئەو پلەو دەرەجەیە دەگەڕێتەوە کە لە (ملكوت الأعلى)دا شەیتان هەیبوو ﴿فاخرج إنك من الصاغرين﴾ دەسا هەر ئێستا دەرچۆ، بەڕاستیی تۆ لە ڕیزی سووك و ڕیسواکاندایت ﴿[14] قال انظرني إلى يوم يبعثون﴾ شەیتان وتی: خوایە! تا ئەو کاتەی گشت خەڵکان دەمرێن و زیندوو دەکرێنەوە مۆڵەتم بدە ﴿[15] قال إنك من المنظرين﴾ خوایش فەرمووی: بێگومان لە مۆڵەتدراوەکانیی و، تا ڕۆژی زیندوو بوونەوەیش هەردەمێنیت،

بەڵێ..هێشتنەوەی شەیتان هەتا رۆژی زیندووبوونەوەی گشت خەڵكیی، لەبەر ئیبتیلا وئیرادەو بریارێكە خۆی دەیزانێ ﴿١٦ قال فبما اغویتنی لأقعدن لهم صراطك المستقیم﴾ ئەوجا شەیتان كەوتە ململانێ وعینادەوەو وتی: چونكە گومراتكردم، شەرتبێ رێ راستەكەی تۆیان لێبگرم ﴿١٧ ثم لآتینهم من بین أیدیهم ومن خلفهم وعن أیمانهم وعن شمائلهم﴾ ئەوساش لە بەردەم ولەدوایانەوەو، لەراست ولەچەپیانەوە بۆیانبێم وبچمە جەستەیانەوەودنیاوقیامەتیان لێچەواشە بكەم ﴿ولا تجد اكثرهم شاكرین﴾ " ئەوكات دەبینی كە زۆربەیان سوپاسگوزارو یەكتاپەرست نابن، گوێ بە فەرمانت نادەن و بەدوای مندا دێن، بەداخەوە ئیبلیس گومان و سوێندەكەی خۆی بردە سەرو، ملی خەڵكێكی زۆری شكاندو گومراو سەرگەردانی كردن، وەكو خوای گەورە لەجیگایەكی تردا دەفەرموێ: (ولقد صدق علیهم إبلیس ظنه..) ﴿١٨ قال اخرج منها مذءوما مدحورا﴾ خوا فەرمووی: دەسا لەو پلەتە لە ئاسمان، یان لە بەهەشت بە ئابروو چوویی و پەستیی و دەركراویی بچۆرە دەرێ ﴿لمن تبعك منهم لأملأن جهنم منكم اجمعین﴾ دەڵنیابە دۆزەخ لە خۆت وئەوانەی دوات دەكەون پرئەكەم، لە تۆڵەی ئەولاساریی و بێ گوێیەدا ﴿١٩ ویاآدم اسكن انت وزوجك الجنة﴾ بە ئادەمیشمان گوت : ئەی ئادەم! تۆخۆت و هاوسەرەكەت دوای دەركردنی شەیتان لە بەهەشتدا ساكن و سەقامگیر بن و بمێننەوە ﴿فكلا منها حیث شئتما﴾ هەرچیش لەوێ ئارەزووتانە بخۆن ﴿ولا تقربا هذه الشجرة﴾ بەس توخنی ئەو درەختەیە مەكەون بۆم دیارییكردون. ﴿فتكونا من الظالمین﴾ كەلێتان خوارد لە سنوورشكێنان و ستەمكاران دەبن.

**شەیتان باوە ئادەم و دایە حەوا دەخەڵەتێنێ:**

﴿٢٠ فوسوس لهماالشیطان لیبدی لهما ما ووری عنهما من سوءاتهما﴾ شەیتان لێیان نەگەراو چووە بن كلێشەیانەوە، بۆئەوە شەرمێنگاوعەورەتیان-كە لەوان داپۆشرابوو - دەرخاو شەرمەزاربن ﴿وقال ما نهاكما ربكما عن هذه الشجرة﴾ و پێیگوتن : پەروەردگارتان كەنەیدەهێشت ئێوە لەمدارە نزیك ببنەوەو لێیبخۆن ﴿إلا ان تكونا ملكین﴾ هەر بۆئەوەبوو ئێوە نەبنە فریشتەو، وەكو ئەوان خێروشەر نەزانن ﴿او تكونا من الخالدین﴾ یان هەرگیز نەمرن و بە هەتا هەتایی لە بەهەشتدا بمێننەوە , خۆ ئەگەر بۆ بەهێز بوون بێت لەسەر خوا پەرستیی، خواردنی ئەو درەختە قەیناكات ﴿٢١ وقاسمهما﴾ شەیتان زانی بەوئاسانییە بروای پێناكەن، بۆیە سوێندی بۆ خواردن و وتی: ﴿إنی لكما لمن الناصحین﴾ بە راستیی من لە دڵسۆزان و خێر خوازانم بۆتان و بەدڵ ئامۆژگاریتان دەكەم،"نامەوێ فریوتان بدەم بۆچی باوەرناكەن!"﴿٢٢ فدلاهما بغرور﴾ ئینجا بە فرو فێڵ وسوێندەكەی، فریویدان وتەماحی خستە بەریان ولەخشتەی بردن ﴿فلما ذاقا الشجرة﴾ ئینجا هەر كەلە بەری درەختەكەیان چەشت ﴿بدت لهما سوءاتهما﴾

الجزء الثامن — سورة الأعراف

قَالَ مَا مَنَعَكَ أَلَّا تَسْجُدَ إِذْ أَمَرْتُكَ قَالَ أَنَا خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ
وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ ﴿١٢﴾ قَالَ فَٱهْبِطْ مِنْهَا فَمَا يَكُونُ لَكَ أَن تَتَكَبَّرَ
فِيهَا فَٱخْرُجْ إِنَّكَ مِنَ ٱلصَّٰغِرِينَ ﴿١٣﴾ قَالَ أَنظِرْنِيٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ
﴿١٤﴾ قَالَ إِنَّكَ مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ ﴿١٥﴾ قَالَ فَبِمَآ أَغْوَيْتَنِي لَأَقْعُدَنَّ لَهُمْ
صِرَٰطَكَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴿١٦﴾ ثُمَّ لَءَاتِيَنَّهُم مِّنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ
وَعَنْ أَيْمَٰنِهِمْ وَعَن شَمَآئِلِهِمْ وَلَا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَٰكِرِينَ ﴿١٧﴾ قَالَ
ٱخْرُجْ مِنْهَا مَذْءُومًا مَّدْحُورًا لَّمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكُمْ
أَجْمَعِينَ ﴿١٨﴾ وَيَٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ فَكُلَا مِنْ حَيْثُ
شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٩﴾ فَوَسْوَسَ
لَهُمَا ٱلشَّيْطَٰنُ لِيُبْدِيَ لَهُمَا مَا وُۥرِيَ عَنْهُمَا مِن سَوْءَٰتِهِمَا وَقَالَ
مَا نَهَىٰكُمَا رَبُّكُمَا عَنْ هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةِ إِلَّآ أَن تَكُونَا مَلَكَيْنِ أَوْ تَكُونَا
مِنَ ٱلْخَٰلِدِينَ ﴿٢٠﴾ وَقَاسَمَهُمَآ إِنِّي لَكُمَا لَمِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ ﴿٢١﴾
فَدَلَّىٰهُمَا بِغُرُورٍ فَلَمَّا ذَاقَا ٱلشَّجَرَةَ بَدَتْ لَهُمَا سَوْءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا
يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ ٱلْجَنَّةِ وَنَادَىٰهُمَا رَبُّهُمَآ أَلَمْ أَنْهَكُمَا
عَن تِلْكُمَا ٱلشَّجَرَةِ وَأَقُل لَّكُمَآ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمَا عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٢٢﴾

١٥٢ — قالا ربنا

خێرا جل و بەرگەکەیان لەبەرا داماڵراو عەیب و عەورەتیان دەرکەوت بۆ یەکتر ﴿وطفقا یخصفان علیهما من ورق الجنة﴾ بە پەلە بەگەڵای بەهەشت دەستیانکرد بە داپۆشینی عەورەتیان ، خۆ هەرخواش ئەزانێ ئەوگەڵایە لە چیبوو ؟ ﴿وناداهما ربهما﴾ ئەوسا پەروەردگاریان بانگیکردن: ﴿ألم انهکما عن تلکما الشجرة﴾ ئایا رێم لێ نەگرتن لەو درەختە بخۆن ؟ ﴿واقل لکما إن الشیطان لکما عدو مبین﴾ وپێیشم نەوتن: شەیتان بۆتان دەوژمنێکی ئاشکرایە نەتانخەڵە تێنێ ؟ ﴿٢٣ قالا ربنا ظلمنا انفسنا﴾ وتیان: پەروەردگارمان ! تاوانی خۆمانبووو، هەرخۆشمان بووین ستەممان لە خۆمانکردو، فەرمانەکەتمان شکاند ﴿وإن لم تغفر لنا وترحمنا﴾ و ئێستاش ئەگەر لێمانخۆش نەبی و، میهرەبانیمان لەگەڵ نەکەیت ﴿لنکونن من الخاسرین﴾ دەچیینە ریزی زیانمەندانەوە.



قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ
الْخَاسِرِينَ ﴿٢٣﴾ قَالَ اهْبِطُوا بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ وَلَكُمْ فِي
الْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَاعٌ إِلَىٰ حِينٍ ﴿٢٤﴾ قَالَ فِيهَا تَحْيَوْنَ وَفِيهَا
تَمُوتُونَ وَمِنْهَا تُخْرَجُونَ ﴿٢٥﴾ يَا بَنِي آدَمَ قَدْ أَنزَلْنَا عَلَيْكُمْ لِبَاسًا
يُوَارِي سَوْآتِكُمْ وَرِيشًا وَلِبَاسُ التَّقْوَىٰ ذَٰلِكَ خَيْرٌ ذَٰلِكَ مِنْ
آيَاتِ اللَّهِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿٢٦﴾ يَا بَنِي آدَمَ لَا يَفْتِنَنَّكُمُ
الشَّيْطَانُ كَمَا أَخْرَجَ أَبَوَيْكُم مِّنَ الْجَنَّةِ يَنزِعُ عَنْهُمَا لِبَاسَهُمَا
لِيُرِيَهُمَا سَوْآتِهِمَا إِنَّهُ يَرَاكُمْ هُوَ وَقَبِيلُهُ مِنْ حَيْثُ لَا تَرَوْنَهُمْ
إِنَّا جَعَلْنَا الشَّيَاطِينَ أَوْلِيَاءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٢٧﴾ وَإِذَا فَعَلُوا
فَاحِشَةً قَالُوا وَجَدْنَا عَلَيْهَا آبَاءَنَا وَاللَّهُ أَمَرَنَا بِهَا قُلْ إِنَّ اللَّهَ
لَا يَأْمُرُ بِالْفَحْشَاءِ أَتَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٢٨﴾ قُلْ
أَمَرَ رَبِّي بِالْقِسْطِ وَأَقِيمُوا وُجُوهَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ
وَادْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ كَمَا بَدَأَكُمْ تَعُودُونَ ﴿٢٩﴾ فَرِيقًا
هَدَىٰ وَفَرِيقًا حَقَّ عَلَيْهِمُ الضَّلَالَةُ إِنَّهُمُ اتَّخَذُوا الشَّيَاطِينَ
أَوْلِيَاءَ مِن دُونِ اللَّهِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ ﴿٣٠﴾



## گشت لەبەهەشت دەر پەڕێنران :

﴿٢٤ قال اهبطوا بعضکم لبعض عدو﴾ خوا فەرمووی: دەساهەر ئێستا هەمووتان داگەڕێنە خوارێ و، بشبنە دوژمنی یەکتر (ئیبن کەسیر) ئەڵێ: ئەوی مەبەستە لەم داگەڕێنە خوارەوەدا باوە ئادەم و شەیتانە، وەك لە سوورەتی (طه)دا ئەفەرموێ (إهبطا منها) هەرچەند (خاتوو حەوا) یش لەوێ بووبێ ﴿ولکم فی الأرض مستقر ومتاع إلی حین﴾ هەتا ماوەیەکیش جێ وشوێنی ژیان ومانەوەتان لەزەویدا بۆ هەیە ﴿٢٥ قال فیها تحیون﴾ خوا فەرمووی: لەوێ دەژیین و ﴿وفیها تموتون﴾ ولەوێش دەمرن ﴿ومنها تخرجون﴾ و لەوێش دەردەهێنرێن بۆ وەرگرتنی پاداشت و تۆڵەی رۆژی حەشرتان ﴿٢٦ یا بنی آدم قد انزلنا علیکم لباسا﴾ ئەی رۆڵەکانی ئادەم! بێگومان ئێمە جل وبەرگێکمان پێداون ﴿یواری سوآتکم وریشا﴾ عەیب و عەورەتتان دادەپۆشێ و، هۆی جوانیی و خۆ ئارایشدانیشە ﴿ولباس التقوی ذلك خیر﴾ بەڵام جلوبەرگی تەقواو پارێزکاریی و، شەرم وشکۆو کردەوەی چاك و دەرنە چوون لە سنوورەکانی خوا، ئەوە لەهەموو باشترە، دەسائێوە بە تەقواوە خۆ پەیوەستکەن. ﴿ذلك من آیات الله﴾ ئەو بەخششانەش برێکن لەنیشانەکانی دەسەڵات و توانایی خوا، ئەوە لەئاسمانەوە باران دەبارێنێ و، لۆکەو کەتان و خوریی و کورك و هەموو شتێکی پێ بەرهەم دێنێ و، ئێوەیش بەئارەزووی خۆتان هەموو جۆرە جل وبەرگێکی لێدروست دەکەن ﴿لعلهم یذکرون﴾ بەشکو پەند بگرن و بیر بکەنەوەو بگەڕێنەوە لای خواو شوکرانە بژێرین.

## ئەی بنیادەم! شەیتان نەتان خەڵەتێنێ:

﴿٢٧ یابنی آدم لا یفتننکم الشیطان﴾ ئەی نەوەکانی ئادەم! وریا بن شەیتان فریوتان نەداو، لە ئایین وەرتان نەگێڕێ ﴿کما اخرج ابویکم من الجنة﴾ هەروەك باوك و دایکتانی بەفرۆفێڵ لە بەهەشت بەدەرکردندا ﴿ینزع عنهما لباسهما﴾ و جل و بەرگەکەشیانی لێداماڵین ﴿لیریهما سوءاتهما﴾ بۆئەوە عەورەتی خۆیانیان نیشان بداو ببینن.

بەڵێ دیارەکە مەبەستی شەیتان تەنهاوتەنها دەرخستنی عەورەتە و، ئابڕوو بردن و سووککردنی بنیادەمە، بۆیە ئەمرۆش قوتابییەکانی دەبینی - لێرەو لەوێ- برەوو رەواج دەدەن بەداماڵینی جل وبەرگ ، وە بە هەموو هێزێکیانەوە بانگهێشەی ژنان دەکەن بۆ خۆ ڕووتکردنەوەو، خۆ دەرخستن و تێکەڵبوون بەپیاوان و، هەڵهاتن لە داب و نەریتە ئیسلامییەکان، بەناوی ژیارو پێشکەوتن و شارستانیەتەوە..! لەپشت ئەوەیشەوە مەبەستەکە دیارەو ئاشکرایە کە: تێکدان و خراپکردنی کۆمەڵ و کۆمەڵگەیە، بە وروژاندنی ئارەزووە جنسیەکان و، نەهێشتنی ئەخلاق و حورمەت وریزی ناموس و، بێ غیرەتکردنی مرۆڤەکان لە ئاستی شەرەفیاندا.. ئاشکرایە کە بەرزکردنەوەی ئاڵای کۆن و تازە لەلایەن شەیتان و قوتابیەکانەوە هەربۆ ئەو مەبەستەیە، ئەگەرچی ئێستا شێوەو ڕەنگ و دەنگیشی گۆڕابێت، بەراو بۆچوونی من ئەوسووکایەتیە کە ئەمرۆ بەژنان دەکرێت لەلایەن عەلمانیەکانەوە، لەمێژووی کۆن وجاهیلیەتیشدا نەکراوە ! من نامەوێ لەم کورتە تەفسیرەدا هێندێ لەوسووکایەتیانە باس بکەم بەژنان دەکرێن ، ئەگینە هیچ پلەیەك نەماوەتەوە بۆیان مایەی قەدرو ڕێز بێت بۆیان ﴿إنه يراكم هو وقبيله من حيث لا ترونهم﴾ وشیار بن لەشەیاتینەکان ! چونکە هەمیشە خۆیان و، کۆمەڵەو دەستەو بەستەیان ئێوە دەبینن، بەڵام ئێوە ئەوان نابینن.

**هەندێ لەزاناکان دەڵێن:** ئەم ئایەتە بەڵگەی ئەوەیە کە (جن)یەکان هەرگیز نابینرێن !. هەندێکیش دەڵێن: ئەگەرچی ئاواش بێ، بەڵام هەر رەواو دروستە ببینرێن. چونکە فەرموودەیەکی زۆرو زەبەنە هاتوون کە هەر لەم دنیایەدا دەبینرێن، لەسوورەتی (ئەحقاف) و (جن)یشدا زیاتر لەمبارەیەوە نووسراوە، دەتوانی سەیری بکەیت ﴿إنا جعلنا الشياطين أولياء للذين لايؤمنون﴾ بەڕاستیی ئێمە شەیاتینەکانمان کردۆتە دۆست و یارمەتیدەری ئەوکەسانە بڕوایان بەخوا نییە، هەتا پتر سەرلێشێواوبن، واتە: کافرو خوانەناسەکانن هەردەم گوێڕایەڵیان دەکەن. ﴿[٢٨] وإذا فعلوا فاحشة﴾ ئەوەندەش سادەو نەزانن هەرکاتێ کارێکی بەدفەڕ و ئابڕوو بەربکەن ، وەك گەڕان بە دەوری کابەدا بە ڕووتیی و، شەریك و هاوبەشدانان بۆ خوای گەورە، ئەوسا سەرزەنشت بکرێن لەسەرئەوکارە ﴿قالوا وجدنا عليها آباءنا﴾ ئەڵێن: باوباپیرانیشمان وادیتووە، بۆیە ئێستا ئێمەش بەدوایاندا دەچین ! ﴿والله أمرنا بها﴾ خوایش فەرمانی پێکردووین وابکەین !! ﴿قل إن الله لا يأمر بالفحشاء﴾ ئەی پێغەمبەر! ﷺ بڵێ: بەڕاستیی هەرگیز خوا فەرمان بە کاری دزێوو ناشیاوی وا نادا ﴿أتقولون على الله مالا تعلمون﴾ چۆن لە سەر خوا شتێکی ناهەق دەڵێن و شتی نەشیاو هەڵدەبەستن، کە ئاگاتان لێ نیەو نازانن ڕاستە ؟! ﴿[٢٩] قل أمر ربي بالقسط﴾ ئەی پێغەمبەر ! ﷺ بڵێ: پەروەردگارم هەمووکات فەرمانی بە دادگەریی و کاری چاك کردووە، نەك بە خراپەکاریی و فاحیشە، وەکو ئەوانە ئەڵێن ﴿وأقيموا وجوهكم عند كل مسجد﴾ وە لەکاتی هەموو کڕنووش و" نوێژێکیشدا"تەنها ڕوولە خوا بکەن" و خۆتان هەر بۆ خوا یەکلا بکەنەوە" ﴿وادعوه مخلصين له الدين﴾ وە بەدڵێکی پاکەوە بەردەوام لەو بانگ بکەن و، دینداریی و ملکەچیی بۆئەو بکەن و" هەر ئەو بپەرستن ﴿كما بدأكم تعودون﴾ بزانن هەروەکو لە سەرەتاوە ئێوەی لە نەبوون بەدیهێنا، هەر ئاواش گشتان زیندوودەکاتەوەو ئەگەڕێنەوە لای ئەو ﴿[٣٠] فريقا هدى﴾ دەستەیەکیانی ڕێنماییکرد بۆ ڕێگای راست و دروست و بەرێی چاکدا چوون ﴿وفريقا حق عليهم الضلالة﴾ ودەستەیەکیشیان – بەهۆی کاروکرداری خۆیانەوە- گومڕابوونیان لە سەر چەسپا ﴿إنهم اتخذوا الشياطين أولياء من دون الله﴾ چونکە ئەوان لە باتی خوا شەیتانیان کردە یاریدەرو دۆستی خۆیان ﴿ويحسبون أنهم مهتدون﴾ ووایشیان دەزانی لەسەر ڕێی هەقن و ڕێنمان.

**كە ویستتان بچنە نوێژەوە جل و بەرگی جوان لەبەر بكەن:**

پێشەوا(موسلیم) لە (ئیبن عەبباس)ـە وەدەگێڕێتەوەو ئەڵێ: لەسەردەمی نەفامیی و جاهیلیەتدا، ژنان بەرووتی تەوافی كابەیان دەكردودەسووڕانەوەو، تەنها پەڕۆیەكیان لەسەر شەرمینگایان دادەناو دەیانگوت: ئەگەرچی ئەمڕۆ هەمووی یا هەندێكی بە دەرەوەبێ، لەوە زیاتر بە حەلاڵ و ڕەوای نازانم دەركەوێ !! ئەوجا لە بەرامبەر ئەوكارە دزێوەوە خوای گەورە فەرمووی:﴿[٣١] یا بنی آدم خذوا زینتكم عند كل مسجد﴾ ئەی ڕۆڵەكانی ئادەم ! هەركە دەچنە مزگەوت بۆ نوێژو هەر خوا پەرستیەكی تر، جل وبەرگی جوان وپاك وخاوێن لەبەر بكەن. ﴿وكلوا واشربوا ولا تسرفوا﴾ دەسا لە حەلاڵ بخۆن و، بخۆنەوەو، هەرگیز زۆر خۆریی و زیادەڕەویی مەكەن ﴿إنه لا یحب المسرفین﴾ چونكە خوا خۆشی لەوانە نایە ئەندازەشكێنی دەكەن و، لەسنوور دەردەچن. هەندێ لەزانایانی (سەلەف) دەڵێن: خوای گەورە تەواویی بابەتە پزیشكییەكانی لەنیوەی ئەم ئایەتەی: (كلوا واشربوا ولا تسرفوا)دا كۆكردۆتەوە،(ئیبن عەباس) لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێ: هەرچی دەخۆی بخۆ، هەرچیش لەبەر دەكەیت لەبەری بكە، بەمەرجێ نەگاتە زیادەخۆریی و، دەعیەو فیز كردن. بوخاریی/كتاب اللباس ١٨٢/٧ ﴿[٣٢] قل من حرم زینة الله التی اخرج لعبادە والطیبات من الرزق﴾ بڵێ: كێیە، جل وبەرگی جوان و خشڵ و ڕزق و ڕۆزیی و بژێوی خاوێن و پاكژی -كە خوا بۆ بەندەكانی ڕەوا داوە- حەرام و یاساغكردووە ؟ واتە: هەمووشتێكی چاك وپاكی دروستكردووە بۆ مرۆڤەكان و حەلاڵیشی كردووە بۆیان. (قورتوبی) ئەڵێ: ئەم ئایەتە جوانترینی جل وبەرگ و، خشڵ و خۆڕازاندنەوەی حەلاڵكردووە بۆ مرۆڤەكان، بەتایبەت لەڕۆژەكانی هەینیی و دووجەژنەكە و، بۆنە شەرعیەكاندا ، كەوابوو دنیا لەخۆ حەرامكردن قەدەغەیە ﴿قل هی للذین آمنوا فی الحیاة الدنیا﴾ بڵێ ئەو زینەت و جوانیە بۆ ئەو كەسانەیە كە لەم ژیانی دونیایەدا باوەڕیان هێناوە، واتە: ئەو جوانیی و زینەتە لە بنەڕەتدا هەر شایانی ئیماندارانە، ئەگەرچی لای مرۆڤی ئیماندار دنیاكەم بەهاو بێ بایەخە، بۆیە دەبینی گەلێ جار كافر سەروەتی لە موسڵمان زۆرترە ﴿خالصة یوم القیامة﴾ بەلاَم لەڕۆژی دواییدا هەر تایبەتی موسڵمانانە. كەواتە ئەم گشت نازونیعمەتی دنیایە لەبنەڕەتدا هەر بۆ موسڵمانان دروستكراوە، ئیتر بۆچی وەك پێویست لەدنیادا نەژین وهەوڵی بۆ نەدەین و، بەناوی زوهدو تەقواوە دنیا لەخۆ حەرام بكەین ؟! ﴿كذلك نفصل الآیات لقوم یعلمون﴾ هەروەك حەلاڵ و حەرامەمان بۆ باسكردن، هەرئاوایش بەڵگەكانی خۆمان بۆخەڵكێكی زانا وتێگەیەشت وشیتەڵ دەكەین، هەتا بەهەڵە ڕەفتار نەكەن.

سُورَةُ الأَعۡرَاف — الجُزۡءُ الثَّامِن

ربع الحزب ١٦

۞ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ وَكُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ
وَلَا تُسۡرِفُوٓاْۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ﴿٣١﴾ قُلۡ مَنۡ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ
ٱلَّتِيٓ أَخۡرَجَ لِعِبَادِهِۦ وَٱلطَّيِّبَٰتِ مِنَ ٱلرِّزۡقِۚ قُلۡ هِيَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ
فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا خَالِصَةٗ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ
لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ﴿٣٢﴾ قُلۡ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ ٱلۡفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنۡهَا وَمَا
بَطَنَ وَٱلۡإِثۡمَ وَٱلۡبَغۡيَ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَأَن تُشۡرِكُواْ بِٱللَّهِ مَا لَمۡ يُنَزِّلۡ بِهِۦ
سُلۡطَٰنٗا وَأَن تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٣٣﴾ وَلِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٞۖ
فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمۡ لَا يَسۡتَـٔۡخِرُونَ سَاعَةٗ وَلَا يَسۡتَقۡدِمُونَ ﴿٣٤﴾
يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ إِمَّا يَأۡتِيَنَّكُمۡ رُسُلٞ مِّنكُمۡ يَقُصُّونَ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِي فَمَنِ
ٱتَّقَىٰ وَأَصۡلَحَ فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴿٣٥﴾ وَٱلَّذِينَ
كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَٱسۡتَكۡبَرُواْ عَنۡهَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ
فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٣٦﴾ فَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوۡ كَذَّبَ
بِـَٔايَٰتِهِۦٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ يَنَالُهُمۡ نَصِيبُهُم مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَتۡهُمۡ
رُسُلُنَا يَتَوَفَّوۡنَهُمۡ قَالُوٓاْ أَيۡنَ مَا كُنتُمۡ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِۖ
قَالُواْ ضَلُّواْ عَنَّا وَشَهِدُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ أَنَّهُمۡ كَانُواْ كَٰفِرِينَ ﴿٣٧﴾

قَالَ ٱدۡخُلُواْ ١٥٤

**پەروەردگار هەر ئەمانە بەکاری دزێوو نارەوا دەزانێ:**

﴿[٣٣] قل إنما حرم ربي الفواحش ما ظهر منها وما بطن﴾ بڵێ: ئەی پێغەمبەر!ﷺ پەروەردگارم هەر کاری خراپ و دزێوو ناشیرینی حەرامکردووە، ئاشکراو نهێنی ﴿والإثم والبغي بغير الحق﴾ وهەم تاوان و گوناح و لەسنوور دەرچوون و، دەستدرێژیی کردن بۆ سەر خەڵك بەناهەق ﴿وان تشركوا بالله ما لم ينزل به سلطانا﴾ وبێ هیچ بەڵگەیەکی خوایی، شەریك وهاوبەش دانێن بۆخوا ﴿وأن تقولوا على الله ما لا تعلمون﴾ و لە ئاخاوتن و قسەکردن، دەربارەی خوا بە بێ زانین و، بەبێ بەڵگە درۆ هەڵبەسن، خوای گەورەودلۆڤان هەر ئەمانەی حەرامکردووە، نەك جل وبەرگی جوان و، خۆڕازاندنەوەو خۆ ئارایشدان و، خواردنی پاك وحەڵاڵ ﴿[٣٤] ولكل امة اجل﴾ ئەمەیش بزانن کە بۆ هەموو ئوممەت وگەلێك ، وادەو ماوەیەك هەیە بۆ لەناوبردن وقڕکردنیان ﴿فإذا جاء أجلهم﴾ جاهەر کە کۆتایی ماوەکەیانهات ﴿لا يستأخرون ساعة﴾ نەسات وکاتێك دوادەکەون ﴿ولا يستقدمون﴾ ونەپێشیش دەکەون لەوسات ووەختەی بۆیان دیاریکراوە، ئەوسایش گشت دەچنەوە لای خوا .﴿[٣٥] يا بني آدم إما يأتينكم رسل منكم﴾ ئەی ڕۆڵەکانی ئادەم! هەر کە پەیامبەرانێ لە خۆتان دێتە لاتان ﴿يقصون عليكم آياتي﴾ و ئایاتەکانی منتان بۆ دەخوێننەوە، دەبێ هەموو بە قسەیان بکەن ﴿فمن اتقى واصلح﴾ ئینجا هەر کەسێکتان پارێزکاربێ و کاروباری چاك بکا ﴿فلا خوف عليهم﴾ ئیتر نە ترس و بیمێکیان لە سەردەبێ بۆقیامەتیان ﴿ولا هم يحزنون﴾ ونە دڵ زویرو خەفەتباریش دەبن بۆ دونیایان ﴿[٣٦] والذين كذبوا بآياتنا﴾ ئەو کەسانەش کەلەمدنیایەدا بەڵگەو نیشانەکانی ئێمەیان بە درۆ دانا ﴿واستكبروا عنها﴾ و بەرامبەریان خۆیان بە گەورە زانیی و، ڕوویان لێ وەرگێڕان ﴿أولئك أصحاب النار﴾ ئەمانە دەبنە هاوڕێی ئاگری دۆزەخ ﴿هم فيها خالدون﴾ بە هەتاهەتاییش تێیدا ئەمێننەوە .

**رابەرە گومڕاکان خۆ لە پەرستیارەکان بزر دەکەن:**

﴿[٣٧] فمن اظلم ممن افترى على الله كذبا﴾ دەبێ کێ لەوکەسە ستەمکارتربێت کە لە سەرخوا درۆ هەڵبەسێ و، بێ بەڵگە بڵێ ئەمە حەڵاڵەو، ئەوە حەرامە ﴿او كذب بآياته﴾ یان ئایەتەکانی خوا بە درۆبخاتەوەو باوەڕیان پێنەکا؟ ﴿أولئك ينالهم نصيبهم من الكتاب﴾ ئەمانە لە دنیادا دەگەن بە بەش ونەسیبی خۆیان لەرزق وکاروکردەیەك خوابۆی نووسیوون ، واتە:چی لە چارەیاندا نووسرابێ- لە خۆشیی ولە ناخۆشیی- دێتە ڕێیان و ئەوقەیان دەبێ، بۆ دواییش چاکەکانیان بەرێدەکرێن بۆبەهەشت و، خراپەکانیشیان بۆجەهەننەم ﴿حتى إذا جاءتهم رسلنا يتوفونهم﴾ هەتا کە (فریشتە) نێرراوەکانمان دێنەلایان و، بەوپەڕی نارەحەتیەوە گیانیان دەکێشن ﴿قالوا اينما كنتم تدعون من دون الله﴾ پێیان ئەڵێن: باشە! ئەو بتانەی کە لە باتی خوا ئەتانپەرستن ئێستا لە کوێن، با ئەمڕۆ فریاتانکەون؟ ﴿قالوا ضلوا عنا﴾ ئەڵێن: لێمان بزر بوون وازیان لێهێناین و، بە باتڵ وناهەق دەرچوون ﴿وشهدوا على انفسهم انهم كانوا كافرين﴾ ئەو حەلە بە دژی خۆیشیان شایەتی ئەدەن ودەڵێن :بەڵێ.. لە دونیادا کافرو خوا نەناسبووین.

**هەر کەس دەچێتە دۆزەخەوە نەحلەت لەهاو ڕەوشتانی خۆی دەکا:**

﴿[٣٨] قال ادخلوا في أمم قد خلت من قبلكم من الجن والإنس في النار﴾ خوا بە موشریك وکافرەکان ئەفەرموێ: دەسا لەگەڵ ئەوجنیی و،ێ ینسانانە کە پێکەوە هاوبیربوون و بەر لە ئێوە لە بەینچوون ، بچنە ناو ئاگرەوە ﴿كلما دخلت أمة لعنت أختها﴾ ئەوسا هەر ئوممەت و گەلێك دەچنە ناو ئەو ئاگرەوە ، نەفرین لەو خەڵکە هاوبیرەی خۆیان دەکەن ﴿حتى إذا اداركوا فيها جميعا﴾ هەتا کە هەموو پێکەوە لەوێ کۆدەبنەوە ﴿قالت اخراهم لأولاهم﴾ تاقمی (پەیرەوکاران)ـیان بە تاقمە سەرۆکەکانیان دەڵێن: ﴿ربنا هؤلاء أضلونا﴾ ئەی پەروەردگاری ئێمە! ئەمانەبوون

ئێمەیان لەدنیادا گومڕاکرد ﴿فآتهم عذابا ضعفا من النار﴾ دەسا تۆیش دوو بەرامبەر لە ئاگری دۆزەخدا سزایان بدە ﴿قال لكل ضعف﴾ خواش دەفەرموێ: بۆ هەردوولاتان سزای دوو بەرامبەر هەیە، سەرۆکەکان لەبەر کوفرەکەیان و، گومڕاکردنی ئێوە، ئێوەیش لەبەر بێ بڕوایی و، شوێنکەوتنی ئەوان" ﴿ولكن لا تعلمون﴾ بەڵام ئێوەنازانن دەستە دۆزەخیەکانی تر، چەندە سزایان سەختە، ئەگینە سەبووریتان بۆدەهات ﴿[٣٩] وقالت اولاهم لأخراهم﴾ ئینجا دەستە یەکەمەکەیان، واتە: سەرۆك وپێشەواکانیان، بەشوێنکەوتەو پەیڕەوەکانیان ئەڵێن: ﴿فما كان لكم علينا من فضل﴾ جا بۆ ئێوەی شوێنکەوتەی ئێمە، هیچتان لەئێمە زیاتر نیە، واتە: ئێمە هەرچیمانکرد، ئێوەیش کردتان، بۆیە هەموومان یەکسان دەرچووین لەسزادا ﴿فذوقوا العذاب بما كنتم تكسبون﴾ دەسابەهۆی ئەو تاوانانەوە کردتانن، ئەم سزایە بچێژن.

**دەروازەکانی ئاسمان لە خوانەناسان دادەخرێن:**

﴿[٤٠] إن الـذين كـذبوا بآياتنـا واسـتكبروا عنهـا﴾ ئەوکەسانەش ئایەتەکانی ئێمەیان بەدرۆ داناو، باوەڕیان پێنەکردن و، لەئاستیان خۆیان بەگەورە گرت ﴿لا تفتح لهم أبواب السماء ولا يـدخلون الجنـة﴾ هـەرگیز دەروازەکـانی ئاسمـان بـۆ ڕۆحیـان و، بـۆ کاروکردەوەیـان ناکرێنـەوەو، ناشچنە بەهەشتەوە ﴿حتى يلج الجمل فى سم الخياط﴾ هـەتا وشتر نەچێ بەکونی دەرزیـی درووماندا، واتـە: خـۆ هەرگیز ئەمە دەست نادات، کەواتە دەست نادات ئەوانیش بچنە بەهەشت ﴿وكـذلك نجـزى المجـرمين﴾ وهـەر ئابـەو شێوەیە تۆڵەی گشت تاوانباران ئەدەین لەدوارۆژدا ﴿[٤١] لهم من جهنم مهاد﴾ ڕایەخیان ئاگرە لـە دۆزەخدا ﴿ومن فوقهم غواش﴾ ولێفـەی سەریشیان هـاڵاوی ئـاگرە، واتـە: بـەڕەی ژێریان و، لێفەی سەریان هەردوو هەر ئاگرە، ﴿وكذلك نجزى الظالمين﴾ دیـارە گشت ستەمکاران ئابەوشـێوە سـەختەیە تۆڵە ئەدەین .

الجزء الثامن | سورة الأعراف

قَالَ ٱدۡخُلُواْ فِيٓ أُمَمٖ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِكُم مِّنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ
فِي ٱلنَّارِۖ كُلَّمَا دَخَلَتۡ أُمَّةٞ لَّعَنَتۡ أُخۡتَهَاۖ حَتَّىٰٓ إِذَا ٱدَّارَكُواْ فِيهَا
جَمِيعٗا قَالَتۡ أُخۡرَىٰهُمۡ لِأُولَىٰهُمۡ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ أَضَلُّونَا فَـَٔاتِهِمۡ
عَذَابٗا ضِعۡفٗا مِّنَ ٱلنَّارِۖ قَالَ لِكُلّٖ ضِعۡفٞ وَلَٰكِن لَّا تَعۡلَمُونَ ﴿٣٨﴾
وَقَالَتۡ أُولَىٰهُمۡ لِأُخۡرَىٰهُمۡ فَمَا كَانَ لَكُمۡ عَلَيۡنَا مِن فَضۡلٖ
فَذُوقُواْ ٱلۡعَذَابَ بِمَا كُنتُمۡ تَكۡسِبُونَ ﴿٣٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ
بِـَٔايَٰتِنَا وَٱسۡتَكۡبَرُواْ عَنۡهَا لَا تُفَتَّحُ لَهُمۡ أَبۡوَٰبُ ٱلسَّمَآءِ وَلَا يَدۡخُلُونَ
ٱلۡجَنَّةَ حَتَّىٰ يَلِجَ ٱلۡجَمَلُ فِي سَمِّ ٱلۡخِيَاطِۚ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي
ٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴿٤٠﴾ لَهُم مِّن جَهَنَّمَ مِهَادٞ وَمِن فَوۡقِهِمۡ غَوَاشٖۚ
وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤١﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ
ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَا نُكَلِّفُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ
ٱلۡجَنَّةِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٤٢﴾ وَنَزَعۡنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنۡ غِلّٖ
تَجۡرِي مِن تَحۡتِهِمُ ٱلۡأَنۡهَٰرُۖ وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي هَدَىٰنَا لِهَٰذَا
وَمَا كُنَّا لِنَهۡتَدِيَ لَوۡلَآ أَنۡ هَدَىٰنَا ٱللَّهُۖ لَقَدۡ جَآءَتۡ رُسُلُ رَبِّنَا بِٱلۡحَقِّۖ
وَنُودُوٓاْ أَن تِلۡكُمُ ٱلۡجَنَّةُ أُورِثۡتُمُوهَا بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٤٣﴾

١٥٥

**صاڵحەکان جێگەیان بەهەشتە:**

﴿[٤٢] والذين آمنوا وعملوا الصاحات﴾ ئەوکەسانەش باوەڕیان هێناو، ئاکاری چاکیان ئەنجامدا ﴿لا نكلف نفسا إلا وسعها﴾ ئێمە لەتوانا بەدەر، هیچ ئـەرکێ ناخەینـە سـەر هیچکەسـێ، بـەڵکو هەمووکەسـێ بـەپێی وزەو توانـای خۆیەتی ﴿اولئك اصحاب الجنة﴾ ئەمانە دەبنە بەهەشتیی ﴿هم فيها خالدون﴾ و بە هەتاهەتاییش لـەوێ ئەمێننەوە. جا بۆ تەواو کردنی نازونیعمەتەکانی خۆی بۆ موسڵمانەکانی بەهەشت ئەفەرموێ: ﴿[٤٣] ونزعنا مافى صدورهم من غل﴾ بـەر لـەوە بچنە بەهەشتەوە هەرچی لـە سینگیاندابێ لە کینـەو ناکۆکیی وحەسـوودیی دای دەماڵین، بۆیـە پێغەمبەر دەفەرموێ: هەرکە موسڵمانان لە ئاگر ڕزگار دەبن، ئەوسا لەسەر پردێك – لەنێوان بەهەشت و دۆزەخدا– ڕا دەگیردرێن، بۆئەوە کە هـەموو کەسێك تۆڵەی گوناهـەکانی دنیای وەرگرێ، جاکە خاوێن کرانەوە، ئەوسامۆڵەت

دەدرێن بچنە بەهەشتەوە، دەسا سوێندم بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە، هەموو کەسێك بەوجێگایەی بەهەشتەی لەماڵەکەی دنیای شارەزاترە. بوخاریی / کتاب المظالم - ٣/ ١٦٧-١٦٨. ﴿تجری من تحتهم الأنهار﴾ لە ژێر کۆشکەکانی ئەو بەهەشتەدا چۆم و رووبار دەچێت، بێگومانە ئەوهەموو رێك وپێککردنە بۆ رازاندنەوەی دیمەن و سیمای جێگاکەیانەو، حورمەت و ریزلێنانە بۆیان ﴿وقالوا الحمد لله الذی هدانا لهذا﴾ جا کاتێ ئەوگشت رێزەی خوایانە دی دەڵێن: سوپاس تەنها بۆ ئەو خوایە کەلەدنیادا ئێمەی خستە سەر ئەم رێگەیەو، رێنماییکردین بۆکارو کردەوەی باش و، لێرەیش پاداشی ئاوای داینەوە ﴿وما کنا لنهتدی لولا أن هدانا الله﴾ خۆ ئەگەر خۆی رێنمایی نەکردباین، هەرگیز رێمانەدەر نەدەکردو بەختیار نەدەبووین ﴿لقد جاءت رسل ربنا بالحق﴾ سوێند بە خوا پەیامبەرانی پەروەردگارمان "بە پەیامی راست و دروستەوە" هاتنە لامان، ئێمەیش بڕوامان پێکردن وشوێنیان کەوتین و، ئەمڕۆش بەختیاربووین ﴿ونودوا أن تلکم الجنة﴾ جاکە بەهەشت دەبینن لەلایەن فریشتەکانەوە" بانگ دەکرێن و، پێیان دەگوترێ ئەم بەهەشتەیە، ئەو بەهەشتەبوو بەڵێنتان پێدرابوو ﴿اورثتموها بما کنتم تعملون﴾ وائەمڕۆ بە هۆی (ئەو کارو کردەوە چاکانەوە لە دنیادا ئەنجامتاندان، پێتاندراو بوونە خاوەنی، واتە: بەهۆی ماندوبوونی خۆتانەوە بوو، وەك ئەم فەرموودەیە" ئیمامی موسلیم هێناویەتی"دەڵێ:((لن یدخل احدا منکم عمله الجنة...)هیچ کەسێکتان بەکاروکردەوەی خۆی ناچێتە بەهەشتەوە، ئەگەر فەزڵی خوانەبێت.

الجزء الثامن — سورة الأعراف

وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِ أَصۡحَٰبَ ٱلنَّارِ أَن قَدۡ وَجَدۡنَا مَا وَعَدَنَا رَبُّنَا حَقّٗا
فَهَلۡ وَجَدتُّم مَّا وَعَدَ رَبُّكُمۡ حَقّٗاۖ قَالُواْ نَعَمۡۚ فَأَذَّنَ مُؤَذِّنُۢ بَيۡنَهُمۡ أَن
لَّعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾ ٱلَّذِينَ يَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبۡغُونَهَا
عِوَجٗا وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ كَٰفِرُونَ ﴿٤٥﴾ وَبَيۡنَهُمَا حِجَابٞۚ وَعَلَى ٱلۡأَعۡرَافِ
رِجَالٞ يَعۡرِفُونَ كُلَّۢا بِسِيمَىٰهُمۡۚ وَنَادَوۡاْ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ أَن سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡۚ
لَمۡ يَدۡخُلُوهَا وَهُمۡ يَطۡمَعُونَ ﴿٤٦﴾ ۞ وَإِذَا صُرِفَتۡ أَبۡصَٰرُهُمۡ تِلۡقَآءَ
أَصۡحَٰبِ ٱلنَّارِ قَالُواْ رَبَّنَا لَا تَجۡعَلۡنَا مَعَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٧﴾ وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ
ٱلۡأَعۡرَافِ رِجَالٗا يَعۡرِفُونَهُم بِسِيمَىٰهُمۡ قَالُواْ مَآ أَغۡنَىٰ عَنكُمۡ جَمۡعُكُمۡ
وَمَا كُنتُمۡ تَسۡتَكۡبِرُونَ ﴿٤٨﴾ أَهَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَقۡسَمۡتُمۡ لَا يَنَالُهُمُ
ٱللَّهُ بِرَحۡمَةٍۚ ٱدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡكُمۡ وَلَآ أَنتُمۡ تَحۡزَنُونَ
﴿٤٩﴾ وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ أَنۡ أَفِيضُواْ عَلَيۡنَا
مِنَ ٱلۡمَآءِ أَوۡ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُۚ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ حَرَّمَهُمَا عَلَى
ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٥٠﴾ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ دِينَهُمۡ لَهۡوٗا وَلَعِبٗا
وَغَرَّتۡهُمُ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَاۚ فَٱلۡيَوۡمَ نَنسَىٰهُمۡ كَمَا نَسُواْ
لِقَآءَ يَوۡمِهِمۡ هَٰذَا وَمَا كَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَجۡحَدُونَ ﴿٥١﴾

وَلَقَدۡ جِئۡنَٰهُم — ١٥٦

**جەحەنەمی پڕی دنیا پەشیمانن:**

﴿[٤٤] ونادی أصحاب الجنة أصحاب النار﴾ جاکە بەهەشتییەکان لەجێی خۆیاندا سەقامگیربوون، بانگی جەهەننەمییەکان دەکەن وپێیان دەڵێن: ﴿أن قد وجدنا ماوعدنا ربنا حقا﴾ ئەو بەڵێنەی پەروەردگارمان پێیدابووین لەدنیادا کەبمانباتە بەهەشتەوەو، رێزوحورمەتمان لێبنێت، واپێیگەیشتین و جێبەجێ بوو ﴿فهل وجدتم ما وعدکم ربکم حقا﴾ ئاخۆ ئێوەش- ئەوسزایەی بەڵێنی پێدابوون - بەراست دەرچووو ئەنجامەکەیتان دەستکەوت ؟ ﴿قالوا نعم﴾ ئەڵێن: بەڵێ پێیگەیەشتین ودەسمانکەوت ﴿فأذن مؤذن بینهم﴾ ئینجا لەو ناوەدا جارچییەك هاوار دەکاو ئەڵێ: ﴿أن لعنة الله علی الظالمین﴾ دەسا هەرچی ستەمکارە، بەرنەحلەتی خوا کەوێ ﴿[٤٥] الذین یصدون عن سبیل الله﴾ ئەوانەی کە خەڵکی لە رێی ئایینی خوا لادەدەن و، رێگری لێدەکەن ﴿ویبغونها عوجا﴾ هەوڵیش دەدەن بە لاروخێچی نیشانی خەڵکی بدەن ﴿وهم بالآخرة کافرون﴾ سەرەڕای ئەوانەیش، بڕوایان بە دوا ڕۆژ نیە !!.

## ئەعراف و یارەکانی ئەعراف:

﴿[٤٦] وبينهما حجاب﴾ و لە نێوان هەردوودەستەکەدا- بەهەشتیی و دۆزەخیی- پەردە-شوورە-یەك هەیە، وەکو لە سوورەتی (حەدید)،ئایەتی(١٣)دا باسی دەکاو دەفەرموێ: (فضرب بينهم بسور له باب) ﴿وعلى الأعراف رجال﴾ وە بەسەر شوورەکەی نێوان بەهەشت ودۆزەخەوە کۆمەڵێ (ژن و) پیاوی موسڵمان هەن.

تێبینی: (ئە عراف) بە شوورەیەکی بەرز دەڵێن کە لە نێوان بەهەشت و دۆزەخدایەو، ئەو ژن و پیاوە موسڵمانانەی لەسەر وەستاوەو، سەیری ئەوخەڵکانە دەکەن کەچاکەو خراپەیان یەکسانەو، راگیردراون تاکۆتا بڕیاری خوایان بۆ دەردەچێت. ﴿يعرفون كلا بسيماهم﴾ هەمووشیان بەسەروسیما دەناسن، دۆزەخیەکان بە ڕووی ڕەش و، بەهەشتیەکانیش بە ڕووی گەش و سپیانەوە. ﴿ونادوا أصحاب الجنة﴾ و لەیارانی بەهەشت بانگ ئەکەن و ئەڵێن: ﴿أن سلام عليكم﴾ سڵاوی خواتان لەسەر بێت، یاخوا لەسزاو تۆڵە پارێزراو بن و هەر لەخۆشیدابن ﴿لم يدخلوها﴾ شیاوی باسە هێمان هەرلە (أعراف) قەتیس ماون و نەچوونەتە بەهەشتەوە ﴿وهم يطمعون﴾ و بە تەمان تێی بچن، چونکە خوا تەماحی ناوەتە بەریان ﴿[٤٧] وإذا صرفت ابصارهم﴾ وکاتێکیش چاویان لەبەهەشتیەکان وەردەگێڕدرێ ﴿تلقاء أصحاب النار﴾ بەرەو ڕووی دۆزەخیەکان دەڕوانن و بەو حاڵە زۆر خراپەیانەوە دەیانبینن ﴿قالوا ربنا لا تجعلنا مع القوم الظالمين﴾ دەڵێن: پەروەردگارمان ! تکات لێ دەکەین مەمانخە ریزی ئەوانەوە ستەمیانکردووە. ﴿[٤٨] ونادى أصحاب الأعراف رجالا﴾ هەرئەو (أعراف)یانە لەپیاوە سەر زلە (دۆزەخی)یەکانی قورەیش بانگ دەکەن ﴿يعرفونهم بسيماهم﴾ کە بەسەرو سیماو دیمەنیان دەیانناسن ﴿قالوا ما اغنى عنكم جمعكم وما كنتم تستكبرون﴾ و ئەڵێن: دیارە ئەو حەشامەت و زۆریەو، ئەو دەعیەو لووت بەرزیی و خۆبەزل زانینەتان لەبارەی باوەڕ هێنانەوە, هیچ کەڵکێکی پێنەگەیاندن و بێ نیازی نەکردن لە سزای ئەم ڕۆژە ؟ ﴿[٤٩] أهؤلاء الذين اقسمتم لا ينالهم الله برحمة﴾ ئایا ئەمانە (بیلال و، سەلمان و..) کەئێستا لەبەهەشتدان هەرئەو باوەڕدارانە نەبوون کەئێوە سوێندتان خوارد: بەر ڕەحمەت وبەزەیی خوا ناکەون و ناڕۆنە بەهەشت، دەسا وابوو؟ ﴿ادخلوا الجنة﴾ خوا پێیان ئەڵێ: دەسا لەپێش چاو ئەوانەوە بچنە بەهەشتەوە ﴿لا خوف عليكم ولا انتم تحزنون﴾ نە هیچ ترستان لەسەرە بۆ ڕۆژەکانی قیامەت ، نە دڵگرانیش ئەبن بۆپاشینانتان.

## جەحەنەمی تامی نیعمەتی بەهەشت ناکەن:

﴿[٥٠] ونادى أصحاب النار أصحاب الجنة﴾ ئینجا دۆزەخییەکانیش لەبەهەشتییەکان بانگ دەکەن و پێیان دەڵێن: ﴿أن افيضوا علينا من الماء أو مما رزقكم الله﴾ تکایە قومێ لەو ئاوە، یان کەمێك لەو ڕۆزییە خوا پێیداون بەشمان بدەن ﴿قالوا إن الله حرمهما على الكافرين﴾ دەڵێن: بێگومان خوا هەردووکیانی بۆ کافران حەرامکردووە ﴿[٥١] الذين اتخذوا دينهم لهوا ولعبا﴾ ئەو کەسانەی کە ئایینەکەیانیان کردۆتە گاڵتەجاڕ ﴿وغرتهم الحياة الدنيا﴾ وژیانی ئەم دونیایە فریویداون ﴿فاليوم ننساهم كما نسوا لقاء يومهم هذا﴾ وا ئەمرۆش ئێمە لەبیرمان کردن، چونکە ئەوان لەدنیادا گەیشتنی ئەم ڕۆژەیان لەبیر خۆیان بردبووەوە ﴿و ماكانوا بآياتنا يجحدون﴾ و ئایەت و نیشانەکانی ئێمەشیان ئینکار دەکرد.

**بڕو بیانوو لەجەحەننەمی وەرناگیردرێ:**

﴿٥٢ ولقد جئناهم بكتاب فصلناه على علم﴾ بێگومان ئێمە لەگەڵ پێغەمبەرەكانماندا نامەیەكی وامان بۆهێنان كە بە زانست و زانیاریی، ڕاست و ناڕاستمان تێیدا لە یەكداوەتەوە ﴿هدى ورحمة لقوم يؤمنون﴾ و ڕێنمایی و میهرەبانیشە بۆ گەلێك بیانەوێ باوەڕ بێنن، چونكە هەر ئەو باوەڕدارانەن ئامادەیی باشیان تێدایە سوودی لێوەگرن ﴿٥٣ هل ينظرون إلا تأويله﴾ ئا خۆ جگە لەچاوەڕوانی بۆ پێشهاتنی ئەنجامی هەڕەشەكانی خوا لەقورئاندا، چاوەڕێی چی بكەن ؟ ﴿يوم يأتي تأويله﴾ ڕۆژێ كە ئاكام و ئەنجامیشی دێ و ڕوون دەبێتەوە ﴿يقول الذين نسوه من قبل﴾ ئەوسا ئەوانەی كە لە پێشدا ئەم ڕۆژەیان لە بیر خۆبردبووەوە ئەڵێن: ﴿قد جاءت رسل ربنا بالحق﴾ بەراستیی پەیامبەرانی پەروەردگارمان بە بەرنامەی ڕاست ورەوانەوە هاتنەلامان و،ڕێی ڕاستیان بۆڕوونكردینەوەو، یاخیش بووین لێیان، وا ئەمڕۆ گیرۆدەبووین ﴿فهل لنا من شفعاء فيشفعوا لنا﴾ بڵێی ئەمڕۆ تكاكارێك هەبێت ، لای پەروەردگارمان تكامان بۆ بكا ؟! واتە: خۆزگە كە سێك دەبوو! ﴿او نرد فنعمل غير الذى كنا نعمل﴾ یان كاشكا دەگونجا بەرەو دونیا بگێڕراینەوە، هەتا كارو كردەوەی باشتر لەجارانمان دەكرد.؟! واتە تەنها ئەم دوو ڕێگە هەیە بۆچارەسەر، دیارە ئەمانیش هیچیان دەست نادەن ﴿قد خسروا انفسهم﴾ بە هەقیقەت خۆیان دۆڕاندو، زیانمەند بوون ﴿وضل عنهم ما كانوا يفترون﴾ و ئەودرۆو دەلەسەیەش هەڵیانبەست- كەدەیانگوت: بتەكان فریامان دەكەون باتڵ بوو و لەبەین چوو.

وَلَقَدْ جِئْنَٰهُم بِكِتَٰبٍ فَصَّلْنَٰهُ عَلَىٰ عِلْمٍ هُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٢﴾ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا تَأْوِيلَهُۥ ۚ يَوْمَ يَأْتِى تَأْوِيلُهُۥ يَقُولُ ٱلَّذِينَ نَسُوهُ مِن قَبْلُ قَدْ جَآءَتْ رُسُلُ رَبِّنَا بِٱلْحَقِّ فَهَل لَّنَا مِن شُفَعَآءَ فَيَشْفَعُوا۟ لَنَآ أَوْ نُرَدُّ فَنَعْمَلَ غَيْرَ ٱلَّذِى كُنَّا نَعْمَلُ ۚ قَدْ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴿٥٣﴾ إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ وَٱلنُّجُومَ مُسَخَّرَٰتٍۭ بِأَمْرِهِۦٓ ۗ أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ ۗ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٥٤﴾ ٱدْعُوا۟ رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿٥٥﴾ وَلَا تُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَٰحِهَا وَٱدْعُوهُ خَوْفًا وَطَمَعًا ۚ إِنَّ رَحْمَتَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ مِّنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٥٦﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ رَحْمَتِهِۦ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَقَلَّتْ سَحَابًا ثِقَالًا سُقْنَٰهُ لِبَلَدٍ مَّيِّتٍ فَأَنزَلْنَا بِهِ ٱلْمَآءَ فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ ۚ كَذَٰلِكَ نُخْرِجُ ٱلْمَوْتَىٰ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٥٧﴾

١٥٧

**ئاسمان و زەمین لە شەش ڕۆژاندا وەدی هاتووە:**

﴿٥٤ إن ربكم الله الذى خلق السموات والأرض فى ستة ايام﴾ بەڕاستیی هەرخوای پەروەردگاری ئێوەبوو توانی ئاسمانەكان و زەویی لەماوەی شەش ڕۆژدا دروست بكات، خۆ ئەگەر ویستبای بەچاو تروكاندنێك دروستی ئەكردن، (ئیبن كەسیر) دەڵێ: شەش ڕۆژەكە ئەمانە بوون: یەكشەممە، دووشەممە، سێشەممە، چوارشەممە، پێنج شەممە، هەینیی، هەر لەڕۆژی هەینیشدا بوو كە بابە (ئادەم) دروستكرا، هەندێ لەزاناكان دەڵێن: هەر ڕۆژەی لەم ڕۆژانە ئەندازەی هەزار ساڵ بوو ﴿ثم استوى على العرش﴾ ئەوسایش بەوشێوەیە كە شایستەو شیاوی زاتی خۆی بێت "جل جلاله" چووە سەر عەرشی فەرمانڕەوایی خۆی، دیارە ئەوخۆی چۆنی مەبەست بێت لەو چوونە سەر عەرشە، ئێمەش هەر بەوجۆرە باوەڕمان پێی هەیە، هەروەك (سەلەف)یش دەڵێن: (أي: استواءً يليق بجلاله من غير تشبيه ولا تمثيل ولا تعطيل ولا

تحريف كما هو مذهب السلف وكما قال الإمام مالك "رحمه الله": إمرار الصفات تمر كما جاءت بلا تشبيه ولا تعطيل فلا يقال: كيف؟ ولم؟ ونحن نؤمن بأن الله على العرش كيف شاء، وكما شاء بلاحد، ولا صفة يبلغها، أو وصف يحدها حاد، نمر الآية والخبر و نؤمن بما فيها، ونكل الكيفية في الصفات إلى علم الله عزوجل. صفوة التفاسير- م١/ص/٤٥٠ ئەویش لە (محاسن التأويل ٧/٢٧٠٨). (ئیبن کەسیر)یش دەڵێ: سەبارەت بەم ئایەتی: (ثم استوى على العرش..)ـە، قسەو بۆچوونی زۆر هەیە، بەڵام ئەم جێگایە شوێنی ئەو درێژە پێدانە نییە، بەڵکو هەر ئەوەندە بەسە کە ئێمەیش بە ڕێی پێشینانماندا وەکو: ئیمامی (مالیك، ئەوزاعیی، سەوریی، لەیس، شافیعیی، ئەحمەد، ئیسحاق) کە بەبێ چۆنیەتیی و، شوبهاندن و، لە کارخستنی صیفەتەکان بەسەریاندا بچین. (نوعەیمی کوڕی حماد)ی "مامۆستای بوخاریی" دەڵێ: (من شبه الله بخلقه فقد كفر، و من جحد ما وصف الله به نفسه فقد كفر، وليس فيما وصف به نفسه ولا رسوله تشبيه). لە(ئیبن قەییم) دەپرسن: ئەگەر دوو کەس لە پەیڕەوانی شافیعیی بکەونە چەلەحانێ لەگەڵ یەکتر، ئەوجا یەکێکیان بڵێ: هەرکەسێ پێی وانەبێ خوا لە ئاسمانە، سەرلێشێواوو سەر لێ تێکچووە، ئەوی دیکەش بڵێ: نەخێر! خوا بێ جێ و مەکانە، ئایا ئەم دوو بووچوونە کامیان لەسەر عەقیدەی ئیمامی شافیعیە ؟ لەوەڵامدا وتی: عەقیدەی شافیعیی و، عەقیدەی پێشینەکانی ئیسلام، وەك ئیمامی (مالیك، سەوریی، ئەوزاعیی، ئیبنولموبارەك، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و ئیسحاق) هەر وەکوعەقیدەی زانا بەڕێزەکانی ترە، وەك (فوزەیلیی کوڕی عیاض، ئەبو سولەیمانی دارانی، سەهلی کوڕی عەبدوڵڵای تەسەتتوری) چونکە لە نێوان هیچ لایەك لەو بەڕێزانەو وێنەیاندا ، هیچ ناکۆکیی و جیاوازیی لە بەرامبەر بنەماکانی ئاییندا نەبووە. ئەوەتە پێشەوا شافیعیی لە سەرەتای کتێبی (الرسالة)دا دەڵێ: (الحمد لله الذي.. هو كما وصف به نفسه و فوق ما يصفه به خلقه). (ئیبن کەسیر)لە کتێبی(البداية والنهاية) دا دەڵێ : (ڕەبیعی مامۆستای شافیعی و پیاوە هەڵکەوتووەکانی مەزهەبی شافیعی، بەبێ باسکردنی هیچ چۆنایەتیەك صیفەتەکانی خوا دەسەلمێنن، یان بە کورت ترو پوخت تر ڕای ئیمامی شافیعی لەمەڕ صیفاتی خواوە لەم سێ خاڵەدا ڕادەگەیەنین:

١- يثبت لله جميع الأسماء والصفات التى نطق بها القرآن ودلت عليها السنة الصحيحة إثباتا بلا تشبيه وتنزيها بلا تعطيل على حد قوله تعالى:(ليس كمثله شئ وهو السميع البصير).

٢- ينزه الله سبحانه وتعالى عن مشابهة خلقه مع إثبات حقيقة هذه الصفات.

٣- التوقف عن الخوض فيما لا مجال للعقل فيه مع اليأس وقطع الطمع عن إذراك كيفية هذه الصفات كما روى ابن أبى حاتم بسنده عن أبى إسحاق بن محمد قال: سمعت الشافعى يقول:(إن للعقل حدا ينتهى إليه كما أن للبصر حدا ينتهى إليه). سەیری کتێبی (آداب الشافعي ومناقبه) بکە.

(ئیمامی زەهەبی) دەڵێ: شەیخولئیسلام – ئەبولحەسەنی هەکاری – ئەبوومو‌حەممەدی مەقدیسی" حافیظ لە ئەبو سەورەوە، ئەبو شوعەیبەوە، ئەوانیش لە موحەممەدی کوڕی ئیدریسی شافیعی یەوە (ناصر الحديث) دەڵێن: (القول فى السنة التى أنا عليها ورأيت عليها الذين رأيتهم مثل سفيان ومالك وغيرهما: الإقرار بشهادة أن لا إله إلا الله

وأن محمد رسول الله، وأن الله على عرشه في سمائه يقرب من خلقه كيف شاء وينزل إلى سماء الدنيا كيف شاء..وذكر سائر الإعتقاد).

وللسلف (رحمهم الله) فی تفسير الإستواء أربع عبارات:

١- العلو ٢- الإرتفاع ٣- الصعود ٤- الإستقرار.

بۆ زیاتر ئاگاداریی لە بۆ چوون و عەقیدەی زانای پایە بەرزو پێشەوا شافیعیی، سەبارەت بە (ئەسما) و(صیفات)ی خوا "جل وعلا" سەیری کتێبی (منهج الإمام الشافعي"رحمه الله" فی إثبات العقيدة) بەرگی/٢، ئامادەکردنی(محمدبن عبدالرحمن بن العقل) بکە. ﴿يغشي الليل النهار﴾ ڕۆژ بە شەو دائەپۆشێ، ڕۆژیش ﴿يطلبه حثيثا﴾ بە پەلە دەکەوێتە شوێنی شەو ﴿والشمس والقمر والنجوم﴾ پەروەردگارتان خۆرو، مانگ و، گشت ئەستێرەکانی دروستکرد ﴿مسخرات بأمره﴾ هەموویشان لە ژێردەستی ئەودا ڕامکراون و، بە پێی یاسای ئەویش دێن ودەچن ﴿الا له الخلق والأمر﴾ چاکیش بزانن! کە دروستکردن و تەگبیر و فەرمانی بۆ بە ڕێوەبردنی هەموو بوونەوەر، هەر بەدەستی ئەوە ﴿تبارك الله رب العالمين﴾ زۆر بە بەرەکەت و گەورەیە خوایەك کە پەروەردگاری گشت جیهانە ﴿[٥٥] ادعوا ربكم تضرعا وخفية﴾ دەسا بەسەر کزیی و بە پەنامەکیی ، لە پەروەردگارتان بلاڵێنەوە ﴿إنه لا يحب المعتدين﴾ بەڕاستیی خوا دەسدرێژکاران و لەسنوور دەرچووانی خۆش ناویٚ، بەتایبەتی لەپاڕانەوەو لاڵەدا، بەوجۆرە کە زۆر دەنگ بەرزبکەنەوەو، هاوار هاوار دەست پیٚ بکەن، وەیان داوای بیٚ جیٚ و بیٚ سنوور بکەن لەخوای گەورە. (ئیبن ماجە) لە بۆ پشتگیری ئەوقسەیە، ئەم فەرموودەیە دیٚنیٚ:((سيكون قوم يعتدون في الدعاء))صحيح الإسناد. ﴿[٥٦] ولا تفسدوا في الأرض بعد إصلاحها﴾ خەڵکینە! دوای باشبوونی ئەم زەوییە" بە هۆی ناردنی پەیامبەرانەوە "عليهم الصلاة والسلام" هەرگیز ئیفسادو خراپەکاری تیا مەکەن ﴿وادعوه خوفا وطمعا﴾ وهەمیشە بەترس وبە ئومێدەوە لە خوا داوا بکەن ﴿إن رحمة الله قريب من المحسنين﴾ بە ڕاستیی ڕەحمەت و بەزەیی خوا لە چاکەکارانەوە نزیکە، جا کەوابوو ئێوەش هەمیشەو بەپەلە چاکە بکەن، بۆیە لە(ئەسەر)دا هاتووە: (بەڵێنەکەی خوا، بەخوا پەرستیی بەرنە سەر، چونکە بڕیاری خۆیەتی کە: ڕەحمەت و بەزەیی ئەو هەمیشە لە چاکەخوازانەوە نزیکە. (ئیبن ئەبی حاتەم).

**هەر خوایە باران دەبارێنیٚ و بەروو بوو شین دەکا:**

﴿[٥٧] وهو الذي يرسل الرياح بشرى بين يدى رحمته﴾ هەر ئەوخوا خاوەن دەسەڵاتەیە کە (باکان) پێشهاتنی باران -بەبەزەیی ودلۆڤانی خۆی -بە مژدە دەر هەڵدەکا ﴿حتى إذا أقلت سحابا ثقالا﴾ هەتا کاتیٚ باکان هەورە قورسە پڕ لە ئاوەکان هەڵدەگرن بەحەواوە ﴿سقناه لبلد ميت﴾ ئێمەش بۆ وڵاتێکی مردووو، واتە: تینوو بیٚ ئاوو وشك دەخەینە ڕیٚ ﴿فأنزلنا به الماء﴾ ئینجا ئاوی پیٚ دەبارێنین ﴿فأخرجنا به من كل الثمرات﴾ و بەو ئاوەیە لە هەموو جۆرە بەرو بوویەکی پیٚ سەوز دەکەین و دەڕویٚ ﴿كذلك نخرج الموتى﴾ هەر بەو شێوەیەش مردووەکان لە گۆڕ دێنینە دەریٚ و زیندوویان دەکەینەوە ﴿لعلكم تذكرون﴾ بەشکو ئێوە بیر بکەنەوە لە دەسەڵاتی خواو، باشتر بڕوا بێنن بە زیندوو بوونەوە. ئەم چەند ئایەتانەی خوارەوەش هەرهەمان مەبەست و مانامان بۆدوویات دەکەنەوە: (ومن آياته أن يرسل الرياح مبشرات..)،(وهو الذي ينزل الغيث من بعد ما قنطوا وينشر رحمته)، (فانظر إلى آثار رحمة الله كيف يحيي الأرض بعد موتها إن ذلك لمحيي الموتى..). ﴿[٥٨] والبلد الطيب يخرج نباته بإذن ربه﴾ ئەو گڵو زەویە چاك وپاكەیە، بە فەرمانی پەروەردگاری خۆی ، سەوزاییو گیاییاشی لیٚ شیندەبیٚ ودەڕویٚ، مرۆڤی

خـاوەن بـاوەڕ وەك ئـەو زەویـە چـاك وپاكەیـە، چـونكە هەرئـەوە بـەرێك وپێكـی عەقیـدەو بیروبـاوەڕ وەبـەردێنیٚ و، هەمیشەیش ملكەچی فەرمانی خوایە ، وەك لە جێگایەكی تردا دەفەرمویٚ:(..وانبتها نباتا حسنا..)٣٧/٣. ﴿والذی خبث لایخرج إلانكدا﴾ ئـەو زەوییـەش خـراپ وكـرو بێكـەڵكبێت، هـەر دڕك وداڵ و گیـای بێكـەڵكی لێشین دەبیٚ." دیارەمرۆڤی لاسارو بیٚ باوەڕیش وەكو ئەو زەوییە خاوەن دڕك ودالەیە، هەرگیز خێرو چاكەی لـیٚ ناوەشێتەوە، ئەگەر چی هەوڵی زۆریشی لەگەڵ بدریٚ، ئەم فەرموودەیەش - كە ئیمامی بوخاریی دەیهێنی ودەفەرمویٚ: (..ومثل ما بعثنی الله به من العلم والهدی..) بەراشكاوی ئەوڕاستیە دوپاتدەكاتـەوە ﴿كذلك نصرف الآیات لقوم یشكرون﴾ ئێمە هەر ئابەو شێوەیەو، بەپێی پێویست بەڵگەی هەمەجۆر دێنینەوە و ئاڵوگۆر ئەكەین بۆ كەسانیٚ سوپاسگوزارو شوكرانە بژێربن .

الجزء الثامن سورة الأعراف

وَٱلۡبَلَدُ ٱلطَّيِّبُ يَخۡرُجُ نَبَاتُهُۥ بِإِذۡنِ رَبِّهِۦۖ وَٱلَّذِي خَبُثَ لَا يَخۡرُجُ
إِلَّا نَكِدٗاۚ كَذَٰلِكَ نُصَرِّفُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَشۡكُرُونَ ﴿٥٨﴾
لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ فَقَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم
مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ ﴿٥٩﴾
قَالَ ٱلۡمَلَأُ مِن قَوۡمِهِۦٓ إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴿٦٠﴾ قَالَ
يَٰقَوۡمِ لَيۡسَ بِي ضَلَٰلَةٞ وَلَٰكِنِّي رَسُولٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ
﴿٦١﴾ أُبَلِّغُكُمۡ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي وَأَنصَحُ لَكُمۡ وَأَعۡلَمُ مِنَ ٱللَّهِ
مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٦٢﴾ أَوَعَجِبۡتُمۡ أَن جَآءَكُمۡ ذِكۡرٞ مِّن رَّبِّكُمۡ عَلَىٰ
رَجُلٖ مِّنكُمۡ لِيُنذِرَكُمۡ وَلِتَتَّقُواْ وَلَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ﴿٦٣﴾ فَكَذَّبُوهُ
فَأَنجَيۡنَٰهُ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥ فِي ٱلۡفُلۡكِ وَأَغۡرَقۡنَا ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ
بِـَٔايَٰتِنَآۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمًا عَمِينَ ﴿٦٤﴾ ۞ وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمۡ
هُودٗاۚ قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓۚ أَفَلَا تَتَّقُونَ
﴿٦٥﴾ قَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦٓ إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِي
سَفَاهَةٖ وَإِنَّا لَنَظُنُّكَ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٦٦﴾ قَالَ يَٰقَوۡمِ
لَيۡسَ بِي سَفَاهَةٞ وَلَٰكِنِّي رَسُولٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٦٧﴾

أُبَلِّغُكُمۡ رِسَٰلَٰتِ ١٥٨

### كورتە باسێكی نووح:

پـاش باسـی بابـە (ئـادەم)مـان، دێتـە سەرباسـی پێغەمبـەرانی تـر، وە لـە(نـووح)ـەوە دەسـت پێـدەكاو دەفـەرمویٚ:﴿[٥٩] لقد ارسلنا نوحا إلی قومە﴾ سوێند بە خوا بەپێغەمبەرێتی (نووح)مان ناردە لای هۆزو نەتەوەكەی خۆی ﴿فقال یا قوم اعبدوا الله﴾ جاگوتی: ئەی هـۆزی من! هـەر (اللـە) بپەرسـتن ﴿مـا لكم مـن إلـە غیرە﴾ كـەبیٚ لـەوهیچ خوایـەكی ترنیـە شـیاوی پەرسـتن بێـت ، واتـە: نـابیٚ لـە بەرنامـەی هـیچ كەسـێكی تـر پـەیڕەوی بكـەن ﴿إنی اخاف علیكم عذاب یوم عظیم﴾ چونكە ئەگـەر ئێوە بڕوا نـەهێنن، بەراسـتیی مـن لـە سزای ئـەو ڕۆژە گەورەیـە لێتـان دەترسم كەپێشـدێت ﴿[٦٠] قـال المـلأ مـن قومـە﴾ كەچـی پیـاوە گـەورەكانی هۆزەكـەی لەوەڵامـدا پێیـانگوت: ﴿إنا لنراك فی ضلال مبین﴾ بـە ڕاسـتی ئێمـە تـۆ لەسـەر لێشـێوانییەكی ئاشكراو نمایانداەبینین! ﴿[٦١] قال یا قوم لیس بی ضلالة﴾ نووحیش فەرمووی: ئـەی هـۆزی من!من گومڕانیم ولە هـەق لامنەداوە، وەك ئێـوە دەڵێن ﴿ولكنی رسول من رب العالمین﴾ بـەڵكو من نێرراوو پەیامبـەری پـەروەردگاری هـەموو جیهانـەكانم ﴿[٦٢] ابلغكم رسـالات ربی﴾ هاتوومـە ڕاسپاردەو پەیامـەكانی پـەروەردگارمتان پـیٚ ڕابگەیـەنم ﴿وانصح لكم﴾ و ئامۆژگاری خێریشتان بكەم ﴿واعلم من الله ما لاتعلمون﴾ وەسەبارەت بەزاتی خوا، من شتیوا دەزانم، ئێوە نایزانن، ئەزانم كە لەسەر بێباوەڕیی تۆڵە دەدرێن. ﴿[٦٣] او عجبتم ان جاءكم ذكر من ربكم علی رجل منكم﴾ نووح ﷺ پێیگـوتن: ئـەریٚ ئێـوە لـەوە سـەرتان سوڕماوە كـە لـە لایـەن پەروەردگارتانـەوە نامـەو ئامۆژگـاریی بۆپیاوێـك لەخۆتان هاتووە؟ ﴿لینذركم﴾ بۆئەوە لە سزای خوا بتانترسێنیٚ ﴿ولتتقوا ولعلكم ترحمون﴾ وخۆشتان بپارێزن لە تۆڵەی خوا، سا بەڵكو لەئەنجامدا بكەونە بەر ڕوحم وبەزەیی ئەو، باشە ئەگەر پیاوێك لەخۆتان بێت بۆكارێكی وا بۆچی سەراسیمە دەبن ؟﴿[٦٤] فكذبوە﴾ كەچی بە درۆیان خستەوەو بڕوایان پێنەكرد! ئەویش لەخوا پاڕایەوە كە

خۆی وئیماندارەكان رزگار بكات «فأنجیناه والذین معه فی الفلك» ئەوسا ئێمەش، نووح و ئەوانەی لەگەڵیا چووبوونە كەشتییەكەوە ڕزگارمانكردن لە نقومبوون. ئەم ئایەتی (فأنجیناه وأصحاب السفینة)یش كە لە سوورەتێكی دیكەدا هاتووە هەربۆ چەسپاندنی ئەو ڕاستیەیە. «واغرقنا الذین كذبوا بآیاتنا» وئەوانەش كە ئایەتەكانی ئێمەیان بەدرۆ دادەنا، لە ئاودا نوقممان كردن، لەجێیەكی تردا دەفەرموێ: (..مما خطیئاتهم أغرقوا..) . «أنهم كانوا قوما عمین» چونكە بە ڕاستیی ئەوانە لەئاستی هەق وراستیەكان هۆزێكی نابیناو كوێر بوون , ڕێگەی هەقیان ونكرد، ئەوجا خوا ئەوانی لەناو برد و پێغەمبەر (نووح)یی عليه السلام سەرخست، وەك لەجێیەكی تردا دەفەرموێ: (إنا لننصر رسلنا..). (ئیبن عەبباس) دەڵێ: لەناو كەشتیەكەدا (٨٠) پیاوێك ڕزگاریان بووو، یەكێكیان ناوی (جرهم) بووو، بە عەرەبی ئاخافتنی دەكرد.

**كورتە باسێكی هوود:**

«[٦٥] وإلی عاد أخاهم هودا» هودی برایشیانمان كردە پێغەمبەرو ناردە لای گەلی عاد. عاد: كوڕی (سامی كوڕی نووح) بوو لەچیای (ئەحقاف)ی (یەمەن) ئەژیان، مەبەست لە ئایەتی (ألم تر كیف فعل ربك بعاد..لم یخلق مثلها فی البلاد)یش هەر گەلەكەی (هود)ـە عليه السلام. هەروەكو ئایەتی: (فأما عاد فاستكبروا فی الأرض بغیر الحق وقالوا من اشد منا قوة..) ئەوهەقیقەتە دووپات دەكاتەوە. «قال یا قوم اعبدوا الله» وتی: ئەی هۆزو نەتەوەی من !دەبێ تەنها خوا بپەرستن «ما لكم من إله غیره» چونكە جگە لەو، هیچ خواو پەرستراوێكی شیاوتان بۆ نیە «افلا تتقون» دەسا بۆ لە سزا ناترسن و خۆ ناپارێزن؟! «[٦٦] قال الملأ الذین كفروا من قومه» كەچی سەرۆك وناودارەكانی گەلەكەی، "ئەوانەیان باوەڕیان نەهێنابوو" وتیان: «إنا لنراك فی سفاهة» بە ڕاستیی ئێمە تۆ بە خەرەفاو و، ڕێگومكردو دەبینین و" لە گێژاوی بێ عەقڵییدا دەژییت «وإنا لنظنك من الكاذبین» ئەوەی راستیبێ وادەزانین تۆ لە درۆزنەكانیت وپێغەمبەر نیت! «[٦٧] قال یا قوم لیس بی سفاهة» هود فەرمووی: هۆزی من! من خەرەفاوو نەفام و بێ مێشك وسەرلێشێواونیم «ولكنی رسول من رب العالمین» بەڵكو پێغەمبەرێكم لەلایەن پەروەردگاری جیهانەكانەوە نێردراوم بۆلای ئێوە «[٦٨] أبلغكم رسالات ربی» پەیامەكانی پەروەردگارمتان پێڕا ئەگەیەنم «وأنا لكم ناصح امین» چاكیش بزانن من ئامۆژگارێكی دڵسۆزو هێمن و ئەمینم بۆتان «[٦٩] او عجبتم أن جاءكم ذكر من ربكم علی رجل منكم» ئەرێ لەوە سەرتان سوڕماوە كە لەلایەن پەروەردگارتانەوە نامەیەكی ئامۆژگاری بۆ كەسێكتان هاتووە «لینذركم» بۆ ئەوە لەقاری خوا بتانترسێنی ؟ «واذكروا إذ جعلكم خلفاء من بعد قوم نوح» ئەوەتان لەیادبێ كە خوای گەورە -لە دوای هۆزی نووح- ئێوەی جێنشین كرد. «وزادكم فی الخلق بسطة» لەخەڵكانی سەردەمی خۆیشتان قەڵافەتی باشتری پێدان "واتە:جەستەی گەورەو بەرزو بەخۆو بەهێز"

الجزء الثامن — سورة الأعراف

أُبَلِّغُكُمْ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي وَأَنَا۠ لَكُمْ نَاصِحٌ أَمِينٌ ﴿٦٨﴾ أَوَعَجِبْتُمْ
أَن جَآءَكُمْ ذِكْرٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنكُمْ لِيُنذِرَكُمْۚ
وَٱذْكُرُوٓاْ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعْدِ قَوْمِ نُوحٍ وَزَادَكُمْ
فِي ٱلْخَلْقِ بَصْۜطَةًۖ فَٱذْكُرُوٓاْ ءَالَآءَ ٱللَّهِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ
﴿٦٩﴾ قَالُوٓاْ أَجِئْتَنَا لِنَعْبُدَ ٱللَّهَ وَحْدَهُۥ وَنَذَرَ مَا كَانَ
يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَاۖ فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ
﴿٧٠﴾ قَالَ قَدْ وَقَعَ عَلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ رِجْسٌ وَغَضَبٌۖ
أَتُجَٰدِلُونَنِي فِيٓ أَسْمَآءٍ سَمَّيْتُمُوهَآ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُم
مَّا نَزَّلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَٰنٍۚ فَٱنتَظِرُوٓاْ إِنِّي مَعَكُم مِّنَ
ٱلْمُنتَظِرِينَ ﴿٧١﴾ فَأَنجَيْنَٰهُ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا
وَقَطَعْنَا دَابِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَاۖ وَمَا كَانُواْ مُؤْمِنِينَ
﴿٧٢﴾ وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًاۗ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ
مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥۖ قَدْ جَآءَتْكُم بَيِّنَةٌ مِّن
رَّبِّكُمْۖ هَٰذِهِۦ نَاقَةُ ٱللَّهِ لَكُمْ ءَايَةًۖ فَذَرُوهَا تَأْكُلْ
فِيٓ أَرْضِ ٱللَّهِۖ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٣﴾

١٥٩

﴿فاذكروا آلاء الله﴾ دەسا بەخششەكانی خوا بێننەوە بیر و سوپاسی بكەن ﴿لعلكم تفلحون﴾ بەشكو بەختیارو سەرفرازبن ﴿٧٠ قالوا اجئتنا لنعبد الله وحده﴾ كەچی یاخیبوون و پێیانگوت: ئەتۆ هاتووی پێمان بڵێت كە: ئێمە تەنها خوا (الله) بپەرستین ؟! ﴿ونذر ما كان یعبد آباؤنا﴾ لەو خوایانە وازبێنین كە باوو باپیرانمان ئەیانپەرستن؟! ﴿فأتنا بما تعدنا إن كنت من الصادقین﴾ بەهەر بەڵاو سزایەكیش هەڕشەمان لێدەكەیت بیهێنە بۆمان ، ئەگەر راست ئەكەیت پێغەمبەریت ﴿٧١ قال قد وقع علیكم من ربكم رجس وغضب﴾ هوود فەرمووی: دە بێگومانبن بەهۆی گوناح وتاوانەكانتانەوە سزاو قاری پەروەردگارتان كەوتە سەرتان وكار لەكار ترازا ﴿اتجادلونني في اسماء سمیتموها انتم وآباؤكم﴾ ئاخۆ راستە ئێوە لەبەرچەند بتێك – كەخۆتان وباوانتان ناوتان لێناون– شەڕە قسەو دەمبازی دەكەن لەگەڵم و، هیچیشیان بەدەست نیە !. بەڵێ...ئەوەنـدەش پەسـت وو نزمبـوون ، چـەند بتێكیـان دەپەرسـت و، هەریەكەشیان ناوێكیان لێنابوون، بۆ نموونە : یەكێ ناوی نرابوویە (سودا) یەكێ (سەموود) یەكێتر هەبا..هتد ﴿ما نزل الله بها من سلطان﴾ خۆ خوایش هیچ بەڵگەیەكی بتەوی دانەبەزاند بوو بۆ راستیان ﴿فانتظروا إنی معكم من المنتظرین﴾ دەسا ئێوە چاوەڕوانبن هەتا سزای خواتان بۆ بێ، وا منیش لەگەڵ ئێوە چاوەڕوانم، بزانین كێ دووچار ئەبێ؟ ﴿٧٢ فأنجیناه والذین معه برحمة منا﴾ ئینجا لەچاكەو بەزەیی خۆمانەوە هوودو ئەوانەی لەگەڵیا بوون ڕزگارمانكردن لەو قارو سزایە بۆیان هات. ﴿و قطعنا دابر الذین كذبوا بآیاتنا﴾ ئەوانەشیان كە بەڵگەو ئایەتەكانی ئێمەیان بەدرۆ داناو خوانەناسبوون ، بنەبڕمانكردن، بەو شێوەیە ئەم چەند ئایەتانە دەڵێن: (ما تذر من شئ أتت علیه إلا جعلته كالرمیم) ٤٢/٥١، یان: (وأما عاد فأهلكوا بریح صرصر عاتیة) ٦/٦٩، یان: (كأنهم أعجاز نخل خاویة) ٧/٦٩، لەگەڵ ئایەتی: (اتبنون بكل ریع آیة تعبثون وتتخذون مصانع لعلكم تخلدون وإذا بطشتم بطشتم جبارین) ١٢٨/٢٦-١٢٩. ﴿وما كانوا مؤمنین﴾ چونكە بێ باوەڕ بوون.

**كورتە باسێكی گەلی سەموود:**

﴿٧٣ وإلى ثمود اخاهم صالحا﴾ بۆلای هۆزی (سەموود)یش برای خۆیانمان (صالح) ناردە لای سەموود. (سەموود): قەبیلەیەك بوون ئەوكاتە لە وڵاتی (حیجر) لە نێوان (حیجازو شام)دا دادەنیشتن، پەیامبەر ﷺ كە ساڵی (٩) نۆیەمی كۆچیی بەوێدا تێپەڕیی بۆ تەبووك، بەهاوەڵانی فەرموو: هەركە بەلای ئەو سزا دراوانەدا تێدەپەڕن ، بادەم بەگریانەوە بن. (متفق علیه). ﴿قال یا قوم اعبدوا الله ما لكم من إله غیره﴾ وتی: ئەی هۆزی من! خوا بەتاك وتەنیایی بپەرستن، چونكە جگە لەو هیچ خوایەكی تربۆ ئێوە نییە شیاوی پەرستن بێت. بەڵێ گشت پەیامبەران یەك داواو، یەك مەبەستیان هەبووە، ئەویش خوا بە یەكناسین وخۆتەسلیمكردنی ئەو بووە: وەك لەسوورەتێكی تردا ئەم ئایەتە هاتووە ودووپاتی ئەوراستییە دەكاتەوەودەفەرموێ: (وما ارسلنا من قبلك من رسول إلا نوحي إلیه أنه لا إله إلا أنا فاعبدون). ﴿قد جاءتكم بینة من ربكم﴾ ئەوا لەسەر داوای خۆتان بەڵگەیەكی زۆر ئاشكراو روونتان بۆهات لەلایەن پەروەردگارتانەوە، تاببێتە بەڵگەی راستیی من ﴿هذه ناقة الله لكم آیة﴾ بەڵگەكەش ئەم وشترەی خوایە كەبۆ ئێوەی ناردووە، ئەی گەلی سەموود ! ﴿فذروها تأكل في أرض الله﴾ دەسا وازی لێ بهێنن بابۆ خۆی لەم زەوییەی خوادا بلەوەڕێت ﴿ولا تمسوها بسوء﴾ و دەخیلتان بم بەهیچ شێوەیەك زیانتان بۆی نەبێ و، دەستی بۆ مەبەن و، ئازاری مەدەن ﴿فیأخذكم عذاب الیم﴾ نەك تووشی سزایەكی ئێش پێگەیەنەر ببن. ئەم چەند ئایەتانەش هەرباس لەومەسەلەیە دەكەن وەكودەفەرموێ: (ونبئهم أن الماء قسمة بینهم كل شرب محتضر) ٢٨/٥٤، یان دەفەرموێ: (هذه ناقة لها شرب ولكم شرب یوم معلوم) ١٥٥/٢٦. ﴿٧٤ واذكروا إذ جعلكم خلفاء من بعد عاد﴾ لە بیرتان بێت پاش

لەناوچوونی گەلی عاد، کە خوای میهرەبان ئێوەی کردە جێنشینی ئەوان ﴿وبواكم فى الأرض﴾ و لەم سەرزەوییەدا سەقامگیری کردن ﴿تتخذون من سهولها قصورا﴾ بۆخۆتان لە پێدەشتەکانییدا کۆشك وخانوو باڵەخانەی نایابی لێبەرز دەکەنەوە ﴿وتنحتون الجبال بيوتا﴾ و لە شاخ و کێوەکانیشدا خانوو دەتاشن و هەڵیان دەکۆڵن و تێیدا نیشتەجێ دەبن ﴿فاذكروا آلاء الله﴾ جا کەواتە با هەمووکات نیعمەتەکانی خواتان لەبیربێ و، شوکرانە بژێر بن ﴿ولا تعثوا فى الأرض مفسدين﴾ هەرگیزیش پێ دامەگرن لەم زەوییەی خوادا لەسەر خراپەکاریی و وێرانکاریی و، فەساد کاریی ﴿٧٥ قال الملأ الذين استكبروا من قومه﴾ کەچی ناودارانی هۆزەکەی - ئەوانەیان خۆیان بەگەورەو زل دادەنا لەئاستی باوەڕدا گوتیان: ﴿للذين استضعفوا لمن آمن منهم﴾ بەو کۆمەڵە باوەڕدارە چەوساوەو بێ دەسەڵاتەیان ﴿اتعلمون ان صالحا مرسل من ربه﴾ ئا خۆ ئێوە دەزانن وباوەڕتان وایەکە: صاڵح لە لایەن پەروەردگاریەوە نێرابێ ؟ دیارەبە گاڵتەوە ئەم قسەیە دەکەن ﴿قالوا إنا بما أرسل به مؤمنون﴾ ئەوانیش وتیان: بەڵێ بە ڕاستیی ئێمە بەوەی کە صاڵح پێی نێردراوە بڕواداریین ﴿٧٦ قال الذين استكبروا إنا بالذى آمنتم به كافرون﴾ ئەوانەی کە دەعیە بازو خۆیان بەزل ئەزانی وتیان: دەسابزانن! ئەوپەیامەی ئێوە بڕواتان هێناوە پێی، ئێمە ئینکاریی و حاشای لێ دەکەین ﴿٧٧ فعقروا الناقة﴾ ئینجا وشترەکەیان پەلپەلکردو کوشتیان ﴿وعتوا من امر ربهم﴾ لە فەرمانی پەروەردگاریان دەرچوون ویاخیی بوون. (قەتادە)دەڵێ: ئەوکەسە کە وشترەکەی پەلپەلکرد تەنیا یەك کەسیانبوو، بەڵام لەبەر ئەوەکە خەڵکەکانی تر بێزارییان لە کوشتنەکەی دەرنەبریی و، پێی ڕازی بوون، خوایش کارەکەی دایە پاڵهەموویان وپێکەوەش گشتیانی سزادان، وەکو لەجێگایەکی تردا ئەفەرمووێ: (فكذبوه فعقروها فدمدم عليهم ربهم بذنبهم فسواها..) ١٤/٩١.یان دەفەرموێ: (وآتينا ثمود الناقة مبصرة فظلموا بها..) ٥٩/١٧. یان دەفەرموێ: (فعقروا الناقة..) ٧٧/٧. ﴿وقالوا يا صالح ائتنا بما تعدنا إن كنت من المرسلين﴾ ئەوسا وتیان: ئەی صاڵح ! دەسا ئەگەر ڕاستە تۆ پێغەمبەریت، ئەو بەڵاو سزایەمان بۆ بێنە هەڕەشەت دەکرد لێمان ﴿٧٨ فأخذتهم الرجفة﴾ ئەوسا کتوپڕ بوومە لەرزەو، هەورە تریشقەیەکی سەخت گرتنی ﴿فأصبحوا فى دارهم جاثمين﴾ جاهەموو لە ماڵەوە بەدەما کەوتن ومردن ﴿٧٩ فتولى عنهم﴾ جا دوای لەناوچوونیان ودوای ئەوهەموو هەوڵە (صاڵح) لەگەڵیدان و کەڵکی نەبوو، لێیان دوورکەتەوە ﴿وقال يا قوم﴾ ووتی: ئەی هۆزەکەم ! ﴿لقد ابلغتكم رسالة ربى﴾ بە ڕاستیی من پەیامی پەروەردگارم پێڕاگەیاندن ﴿ونصحت لكم﴾ وزۆریش بە خێرخوازیی ئامۆژگاریم کردن و ترساندمن لە سزا ﴿ولكن لا تحبون الناصحين﴾ بەڵام من چی بکەم، کە ئێوە ئامۆژگارانتان خۆشناویێ، هەتا خۆتان تووشی ئەوسزایە کردوتیاچوون !!.

الجزء الثامن — سورة الأعراف

وَٱذْكُرُوٓاْ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعْدِ عَادٍ وَبَوَّأَكُمْ
فِى ٱلْأَرْضِ تَتَّخِذُونَ مِن سُهُولِهَا قُصُورًا وَتَنْحِتُونَ
ٱلْجِبَالَ بُيُوتًا فَٱذْكُرُوٓاْ ءَالَآءَ ٱللَّهِ وَلَا تَعْثَوْاْ فِى ٱلْأَرْضِ
مُفْسِدِينَ ﴿٧٤﴾ قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُواْ مِن
قَوْمِهِۦ لِلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُواْ لِمَنْ ءَامَنَ مِنْهُمْ أَتَعْلَمُونَ
أَنَّ صَٰلِحًا مُّرْسَلٌ مِّن رَّبِّهِۦ قَالُوٓاْ إِنَّا بِمَآ أُرْسِلَ بِهِۦ
مُؤْمِنُونَ ﴿٧٥﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓاْ إِنَّا بِٱلَّذِىٓ
ءَامَنتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٧٦﴾ فَعَقَرُواْ ٱلنَّاقَةَ وَعَتَوْاْ عَنْ
أَمْرِ رَبِّهِمْ وَقَالُواْ يَٰصَٰلِحُ ٱئْتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ
ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٧٧﴾ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُواْ فِى دَارِهِمْ
جَٰثِمِينَ ﴿٧٨﴾ فَتَوَلَّىٰ عَنْهُمْ وَقَالَ يَٰقَوْمِ لَقَدْ أَبْلَغْتُكُمْ
رِسَالَةَ رَبِّى وَنَصَحْتُ لَكُمْ وَلَٰكِن لَّا تُحِبُّونَ ٱلنَّٰصِحِينَ
﴿٧٩﴾ وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ أَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم
بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٠﴾ إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ
شَهْوَةً مِّن دُونِ ٱلنِّسَآءِ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ مُّسْرِفُونَ ﴿٨١﴾

١٦٠ — وَمَا كَانَ

**کورتە باسێکی لووط:**

﴿^٨٠ ولوطا إذ قال لقومه﴾ (لووط)ی برازای (ئیبراهیم)یشمان نارده لای هۆزی خۆیی و، پاش بڕوا هێنانی بە ئیبراهیم کۆچی کرد بۆ وڵاتی شام، پاشان خوا کردی بەپەیامبەرو ﷺ ناردی بۆ (سدوم)و گوندەکانی دەوروبەریی، ئەویش بە مەردانە کاری خۆی ئەنجامداو ئامۆژگاریی زۆری کردن کە: دەست لەو کارە دزێوو زۆر ناپەسەندەیە هەڵگرن، کە ئەوەندە خراپ و ناشرین بوو، پێش ئەوان کەسێکی دی نەیکردبوو، ئەوساش پێیگوتن: ﴿اتأتون الفاحشة﴾ ئایا ئێوە کاری شوورەیی و، فاحیشەی وا دەکەن ؟ ﴿ما سبقكم بها من أحد من العالمين﴾ کە بەر لە ئێوە هیچ کەسێك لە جیهاندا نەیکردووە، (وەلیدی کوری عەبدولمەلیك/ خەلیفەی ئەمەویەکان و، دروستکەری مزگەوتی دیمەشق). دەڵێ: ئەگەر خوای گەورە ئەو کارە دزێوەی هۆزی (لووط)ی باس نەکردبا، هەرگیز نەمدەزانی نێر لەگەڵ نێردا جوت دەبن ! ﴿^٨١ إنكم لتأتون الرجال شهوة من دون النساء﴾ ئەرێ ئێوە بۆ ئارەزووی جینسیی خۆتان لەباتی ژنان لەگەڵ پیاوان جووت دەبن؟واتە: ئەوەندە زیادەڕەوو سەرکەش و باغین، کاری وادەکەن! ئەوسا وەك لەئایەتێکی تردا هاتووە: (لوط) ویستی بیانخاتەوە سەر ڕێی ڕاست و لەوکارە دووریان بخاتەوە، بۆیە فەرمووی: (هؤلاء بناتی إن کنتم فاعلین) ١١/٧٩. ﴿بل انتم قوم مسرفون﴾ نا، ئێوە خەڵکێکن سرووشتان تێك چووە و لە (فیطرەت) دەرچوون و زێدە ڕۆییتان کردووە ، بۆیە کاری دەکەن ئاژەڵیش نایکات ﴿^٨٢ وما کان جواب قومه﴾ کەچی وەڵامی گەلەکەی لووط هەر ئەوەندەبوو ﴿إلا ان قالوا أخرجوهم من قريتكم﴾ کە وتیان: (لووط) و شوێن کەوتووەکانی لەشارو گوندەکانتان دەربکەن ﴿إنهم اناس يتطهرون﴾ چونکە ئەوانە کەسانێکن دەیانەوێ بە پاك و خاوێنی بژین! لەو کارانە ئێمە دەیانکەین ئەوان خۆیان بەپاك دەنوێنن ، دیارە بە لاقرتێیەوە ئەم قسەیە دەکەن ﴿^٨٣ فأنجيناه وأهله إلا امراته﴾ ئیتر ئێمەش خۆی و بنەماڵەکەیمان لەوسزایە ئەوقەیان بوو ڕزگارکرد، تەنیا ژنەکەی نەبێ. خوای گەورە دەفەرموێ:(فأخرجنا من کان فيها من المؤمنين فما وجدنا فيها غير بيت من المسلمين). ﴿کانت من الغابرين﴾ چونکە ئەوکەوتە تەك بە جێماوان و بەڕێ و شوێنی ئەواندا چووو گزیکاری بەمیوانەکانی کرد ﴿^٨٤ وامطرنا عليهم مطرا﴾ بۆ لەناوبردنیان بارانێکی نائاساییمان بارانده سەریان، واتە: بەردەبارانمان کردن و بەردی ژهراویمان بەسەرا ڕشتن، وەك لە جێیەکی تردا دەفەرموێ: (وأمطرنا عليهم حجارة من سجيل منضود، مسومة عند ربك..) ١١/٨٢، پێشەوا (ئەبوو حەنیفە) لەم ئایەتەوە دەڵێ: مرۆی نێرباز دەبێ لەشاخێکەوە بەر بدرێتەوەو، پاشانیش بەردەباران بکرێ، پێشەوا(شافیعی) لە وتەیەکیدا دەڵێ: ئەو جۆرە

الجزء الثامن — سورة الأعراف

وَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓا۟ أَخْرِجُوهُم مِّن قَرْيَتِكُمْ ۖ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ ﴿٨٢﴾ فَأَنجَيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ كَانَتْ مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿٨٣﴾ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا ۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٨٤﴾ وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا ۗ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ ۖ قَدْ جَآءَتْكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ ۖ فَأَوْفُوا۟ ٱلْكَيْلَ وَٱلْمِيزَانَ وَلَا تَبْخَسُوا۟ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ وَلَا تُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَٰحِهَا ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٨٥﴾ وَلَا تَقْعُدُوا۟ بِكُلِّ صِرَٰطٍ تُوعِدُونَ وَتَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ بِهِۦ وَتَبْغُونَهَا عِوَجًا ۚ وَٱذْكُرُوٓا۟ إِذْ كُنتُمْ قَلِيلًا فَكَثَّرَكُمْ ۖ وَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٨٦﴾ وَإِن كَانَ طَآئِفَةٌ مِّنكُمْ ءَامَنُوا۟ بِٱلَّذِىٓ أُرْسِلْتُ بِهِۦ وَطَآئِفَةٌ لَّمْ يُؤْمِنُوا۟ فَٱصْبِرُوا۟ حَتَّىٰ يَحْكُمَ ٱللَّهُ بَيْنَنَا ۚ وَهُوَ خَيْرُ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴿٨٧﴾

١٦١

کەسانە ژنیان هێنابێ، یا نا، دەبێ بەردەباران بکرێن ﴿فانظر کیف کان عاقبة المجرمین﴾ دە بنواڕە بزانە پاشە ڕۆژی تاوانباران چۆن بوو.

## کورتە باسێکی شوعەیب:

﴿[٨٥] وإلی مدین أخاهم شعیبا﴾ بۆ (مەدیەن)یش (شوعەیب)ی برایانمان نارد. (مەدیەن): هەم بە هۆزەکەیی و، هەم بەشارەکەیشی (کە لە ڕێی حیجازەوە نزیکی مەعان)ـە دەوترێ، وەك دەفەرموێ: (..ولما ورد ماء مدین..) ٢٣/٢٨. وە هەروا (أصحاب الایکة)یشیان پێدەگوترێ ﴿قال یاقوم اعبدواالله مالکم من إله غیره﴾ پێیگوتن: ئەی هۆزی من! هەر خوا بەتاك وتەنیایی بپەرستن، چاکیش بزانن کە بێجگە لەو هیچ خوایەکی ترتان نییە کە شایستەی پەرستن بێت ﴿قد جاءتکم بینة من ربکم﴾ بەڕاستیی بەڵگەیەکی گەورەی ڕوونیشتان لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆ هاتووە، لەسەر ڕاستیی پەیامەکەم و ڕاستکردنەوەی باری چەوتی کۆمەڵایەتی ئێوە ﴿فأوفوا الکیل والمیزان﴾ دەبا پێوانەو کێشانەشتان بەرامبەربێ، مافی مەردوم بەناهەق مەخۆن ﴿ولا تبخسوا الناس أشیاءهم﴾ لە شتومەکی مەردوم مەدزنەوە، بێ بەهاو کەم تەماشای ماڵی خەڵکی مەکەن و، فرۆفێڵ و حیلەیان لێ مەکەن، هەربۆ ئەمەیە کە لە جێیەکی دیکەدا ئەفەرموێ: (ویل للمطففین الذین..) ﴿ولا تفسدوا فی الأرض بعد إصلاحها﴾ لە زەویشدا دوای چاککردنی ولادانی فەساد دەست مەکەنە گێرە شێوێنی و، خراپەکاریی و ستەم ﴿ذلکم خیر لکم﴾ هەرئەو ئامۆژگارییانە بۆ ئێوە باشترن لە دژ وەستانیان و بەگوێ نەکردنیان ﴿إن کنتم مؤمنین﴾ ئەگەر بڕواتان هەبێ و ڕاست بکەن و، ددان بە وتەکەمدا بنێن ﴿[٨٦] ولا تقعدوا بکل صراط توعدون﴾ لەسەر ڕێگاکاندا دامەنیشن و هەڕەشە لەوکەسانە بکەن دێن بۆلای شوعەیب و، دەیانەوێ بڕوا بەخوا بێنن، بەڵێ.. ئەو سەر لێشێواوانە ئەمەیان کردبووە خووی خۆیان کە: هەرکەسێك هاتبا بۆلای "شوعەیب" هەڕەشەیان لێدەکرد! ﴿وتصدون عن سبیل الله من آمن به﴾ سەرە ڕێگاکانیان لێمەگرن و، ڕێگەی دینی خوا لەو کەسانە ببەستن باوەڕیان بەخوا هێناوە ﴿وتبغونها عوجا﴾ هەوڵیش بدەن بەلارو چەوتی نیشانی بدەن! داخستنی ڕێگاو بانەکان لەخەڵکانی هاتوو چۆکەر، بەناوی گومرگ و ئازاردانی مەردم، کارێکی زۆرناڕێك وناپەسەندە ﴿واذکروا إذ کنتم قلیلا فکثرکم﴾ ئەی ئەوەتان لەبیرە کە بە ژمارە کەم بوون و خوا زۆری کردن و دەسەڵاتی پێدان، دەسا وەرن سوپاسی بکەن ﴿وانظروا کیف کان عاقبة المفسدین﴾ دەسا تەماشا بکەن وبزانن خراپکاران کاتێ لایاندابێت پاشە ڕۆژیان چۆن بووە ؟ ﴿[٨٧] وإن کان طائفة منکم آمنوا بالذی أرسلت به﴾ ئەوسا ئەگەر دەستەیەکتان باوەڕیان بەوپەیامە هێنا کە بەمنا نێردراوە ﴿وطائفة لم یؤمنوا﴾ و دەستەیەکیشتان بڕواتان نەهێنا ﴿فاصبروا حتی یحکم الله بیننا﴾ دە ئارامتان هەبێ، هەتا خوا خۆی لە نێوانماندا داوەریی دەکا ﴿وهو خیر الحاکمین﴾ و ئەویش لە گشت داوەرەکان چاکترە، ئاشکرایشە کە پاشە ڕۆژی باش هەر بۆ بڕوادارانە، تیاچوون وفەوتانیش تەنیا بۆ بێ باوەڕانە.

کۆتایی جزمی هەشتەم

ولله الحمد والمنة

*** *** ***

﴿[٨٨] قال الملأ الذین استکبروا من قومه﴾ پیاوە ناودارەکانی گەلەکەی شوعەیب – ئەوانەیان کە لەناو گەلەکەیاندا ناودارو دیاری بوون و خۆیان بەگەورەو مەزن دەزانی– وتیان: ﴿لنخرجنك یا شعیب والذین آمنوا معك من قریتنا﴾ شوعەیب! بێگومانبە ئێمە تۆش و ئەوانەش وا لەگەڵ تۆ بڕوایان هێناوە لەشارو وڵاتەکەماندا دەر

دەکەین ﴿أو لتعودن فی ملتنا﴾ وەیان دەبێ بگەڕێنەوە سەردین و ئایینی ئێمە، واتە: ئێوە تەنها هەر ئەم دوو ڕێگایەتان بۆ هەیە: یا بەجێ هێشتنی زێدی خۆتان، یان گەڕانەوە بۆ نێو دین و ئایینی ئێمە ﴿قال أولو کنا کارهین﴾ شوعەیب گوتی: باشە! ئەگەر پێشمان ناخۆشبێ، ئێوە هەر بەزۆر لەدین وەرمان دەگێڕن و ، لەنیشتمان دەرمان دەپەڕێنن؟! ﴿قد افترینا علی الله کذبا إن عدنا فی ملتکم﴾ ئەگەر بگەڕێینەوە ناودین وئایینی ئێوە، بێ سۆ درۆمان لەسەر خوا هەڵبەستووە، کەخۆمان بەئیماندار دادەناو، لەشیرك کەنارمان دەگرت ﴿بعد إذ نجانا الله منها﴾ بەتایبەتی پاش ئەوە کە خوا ڕزگاری کردین لێی ﴿وما یکون لنا أن نعود فیها﴾ و هەرگیز بۆمان ڕەوا نییەو شیاو نییە بگەڕێینەوە نێو ئەو ئایین وبەرنامەیە ﴿إلا أن یشاء الله ربنا﴾ مەگەر خوای پەروەردگارمان حەزبکاو، لەمیهرەبانی خۆی بێبەشمانکات، دیارە ئەوکات دەسەڵاتمان نییە ﴿وسع ربنا کل شئ علما﴾ زانستی پەروەردگارمان هەموو شتێکی گرتۆتەوە، ئاگای لەئێستاو لە ڕابوردوویە ﴿علی الله توکلنا﴾ پشتمان تەنها هەر بەخوا بەستووە، (ئیبن عەباس) دەڵێ: شوعەیب پیاوێکی زۆرصالح ونوێژ خوێن بوو، جا کە قسەی زۆری لەگەڵ کردن و، بێ کەڵك و قازانج بوو، لێیان بێ ئومێد بوو و کەوتە دۆعاونزا لێیان و وتی: ﴿ربنا افتح بیننا وبین قومنا بالحق﴾ پەروەدگارمان! تۆ لە نێوان ئێمەو هۆزەکەماندا بەهەق و دروست داوەریی بەکەو، هەق وناهەق لێك بکەوەو، زاڵمان بکە بەسەریاندا ﴿وأنت خیر الفاتحین﴾ تۆ لەهەموو داوەرێك چاکتریت ، بڕیاری تۆ دوورە لەستەم، گرێ کوێرەکانی ژیانمان هەر بەتۆ دەکرێنەوە ﴿[٩٠] وقال الملأ الذین کفروا من قومه﴾ پیاوە ناودارەکانی هۆزەکەی- ئەوانەی کە بڕوایان نەهێنابوو بەخەڵکەکەیان وت: ﴿لئن اتبعتم شعیبا﴾ ئەمە سوێندی بێت ئەگەر ئێوە پەیڕەوی لە شوعەیب بکەن و وەڵامی داواکەی بدەنەوە ﴿إنکم إذا لخاسرون﴾ بێگومانبن لە زیانمەندان دەبن ﴿[٩١] فأخذتهم الرجفة﴾ ئەوسا بوومە لەرزەو، برووسکەیەکی سەختی وا گرتنی ﴿فأصبحوا فی دارهم جاثمین﴾ هەموو لە ناو خانووەکانی خۆیاندا بێ گیانکەوتن و مردن ، شوعەیب و موسڵمانەکانیش ڕزگاربوون، وەکو لە جێگایەکی تردا ئەفەرموێ: (ولما جاء أمرنا نجینا شعیبا والذین آمنوا معه برحمة منا وأخذت الذین ظلموا الصیحة..). ﴿[٩٢] الذین کذبوا شعیبا﴾ جا ئەوانەی وا شوعەیبیان بە درۆ خستەوەو باوەڕیان پێ نەکرد، وا لەناوچوون ﴿کأن لم یغنوا فیها﴾ دەتگوت هەر گیز لەوێ نەژیاون، کە چی بە موسڵمانەکانیشیان دەگوت شەرتبێ لەم وڵاتەدا دەرتانکەین! جاهەمیسان دەفەرموێ: ﴿الذین کذبوا شعیبا﴾ ئەو کەسانەی شوعەیبیان بە درۆزن داناو، بڕوایان پێ نەهێنا ﴿کانوا هم الخاسرین﴾ بۆ خۆیان بوونە زیانبارو تیاچوو، نەك شوعەیب و موسڵمانەکان ﴿[٩٣] فتولی عنهم﴾ ئینجا"پاش ئەو سزایە بۆیانهات" شوعەیب ڕووی لێوەرچەرخانن و، بەناویاندا ڕۆیشت ﴿وقال یا قوم

الجزء التاسع — سورة الأعراف

۞ قَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦ لَنُخۡرِجَنَّكَ يَٰشُعَيۡبُ
وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَكَ مِن قَرۡيَتِنَآ أَوۡ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَاۚ قَالَ أَوَلَوۡ
كُنَّا كَٰرِهِينَ ٨٨ قَدِ ٱفۡتَرَيۡنَا عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا إِنۡ عُدۡنَا فِي مِلَّتِكُم
بَعۡدَ إِذۡ نَجَّىٰنَا ٱللَّهُ مِنۡهَاۚ وَمَا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّعُودَ فِيهَآ إِلَّآ أَن يَشَآءَ
ٱللَّهُ رَبُّنَاۚ وَسِعَ رَبُّنَا كُلَّ شَيۡءٍ عِلۡمًاۚ عَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلۡنَاۚ رَبَّنَا ٱفۡتَحۡ
بَيۡنَنَا وَبَيۡنَ قَوۡمِنَا بِٱلۡحَقِّ وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡفَٰتِحِينَ ٨٩ وَقَالَ ٱلۡمَلَأُ
ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦ لَئِنِ ٱتَّبَعۡتُمۡ شُعَيۡبًا إِنَّكُمۡ إِذٗا لَّخَٰسِرُونَ
٩٠ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلرَّجۡفَةُ فَأَصۡبَحُواْ فِي دَارِهِمۡ جَٰثِمِينَ ٩١
ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ شُعَيۡبٗا كَأَن لَّمۡ يَغۡنَوۡاْ فِيهَاۚ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ شُعَيۡبٗا
كَانُواْ هُمُ ٱلۡخَٰسِرِينَ ٩٢ فَتَوَلَّىٰ عَنۡهُمۡ وَقَالَ يَٰقَوۡمِ لَقَدۡ
أَبۡلَغۡتُكُمۡ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي وَنَصَحۡتُ لَكُمۡۖ فَكَيۡفَ ءَاسَىٰ
عَلَىٰ قَوۡمٖ كَٰفِرِينَ ٩٣ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا فِي قَرۡيَةٖ مِّن نَّبِيٍّ إِلَّآ
أَخَذۡنَآ أَهۡلَهَا بِٱلۡبَأۡسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ لَعَلَّهُمۡ يَضَّرَّعُونَ ٩٤ ثُمَّ
بَدَّلۡنَا مَكَانَ ٱلسَّيِّئَةِ ٱلۡحَسَنَةَ حَتَّىٰ عَفَواْ وَّقَالُواْ قَدۡ مَسَّ
ءَابَآءَنَا ٱلضَّرَّآءُ وَٱلسَّرَّآءُ فَأَخَذۡنَٰهُم بَغۡتَةٗ وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ٩٥

١٦٢ — وَلَوۡ أَنَّ أَهۡلَ

لقد ابلغتکم رسالات ربی﴾ بەئێش و داخەوە وتی: هۆزەکەم! بەڕاستیی من پەیامەکانی پەروەردگارم پێتانگەیاند ﴿ونصحت لکم﴾ و بە دڵسۆزانەش ئامۆژگاریمکردن، کەچی "لەباتی باوەڕهێنان" گوێتان بۆ نەگرتم و پشتتان لێهەڵکردم! ﴿فکیف آسی علی قوم کافرین﴾ دەسا ئیتر پاش ئەوهەموو هەوڵەم، چۆن بۆ تیاچوونی گەلێکی بێباوەڕی وەك ئێوە من خەفەت بخۆم.

**شارو گوندەکانی پێش تۆشمان ئەزموونکرد:**

﴿[٩٤] وما ارسلنا فی قریة من نبی﴾ هەر پەیامبەرێکمان بۆ هەر شاروو گوندێك ناردبێ و، باوەڕیان پێ نەکردبێ ﴿إلا اخذنا اهلها بالبأساء والضراء﴾ ئێمەش بە نەخۆشیی و، هەژاریی و زیان گرتوومانن ، وتاقییمانکردونەتەوە ﴿لعلهم یضرعون﴾ تا بەڵکو ملکەچ ببن و بپاڕێنەوە لێمان و، لەو لاساریەیان بگەڕێنەوە. ﴿[٩٥] ثم بدلنا مکان السیئة الحسنة﴾ لەپاشان ئەو ناخۆشیی و دەستکورتیەمان گۆڕیی بەخۆشیی و، گوشادی ﴿حتی عفوا﴾ هەتا دووبارە سەرو ماڵیان گەشەی کردەوەو زۆر بوونەوە، بەلاّم هەر نەهاتنە سەرهێڵ، وەکو دەفەرموێ: ﴿وقالوا قد مس آباءنا الضراء والسراء﴾ ولەجیاتی سوپاسگوزاریی و پەشیمان بوونەوە وتیان: بەڕاستیی باوو باپیرانیشمان هەرئاوا ناخۆشیی و، زیانیان دووچار بووەو پاشان دەروویان لێکراوەتەوە، واتە: ئەمە شتێکی سروشتیەو بۆخۆی لە بوونەوەردا ڕوودەدا و، ئێمە بە قاری خوای نازانین ! ﴿فأخذناهم بغتة وهم لایشعرون﴾ ئیتر لەناکاوو کتوپڕ "بیّ ئەوە هەست بکەن و پەشیمان ببنەوە" گرتمانن و دووچارمان کردن، واتە: بەهەردوو جۆرەکە بە بوونیی و، بە نەبوونیی ڕەفتارمان لەگەڵکردن، کەچی ئەوان هەر ناسوپاس بوون !

**چاکیی و صەلاحەت دەبێتە مایەی بژێوی باش:**

﴿[٩٦] ولو ان اهل القری آمنوا واتقوا﴾ ئەگەر خەڵکی ئەو

الجزء التاسع سورة الأعراف

وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ ٱلْقُرَىٰٓ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّقَوْا۟ لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَـٰتٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ وَلَـٰكِن كَذَّبُوا۟ فَأَخَذْنَـٰهُم بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٩٦﴾ أَفَأَمِنَ أَهْلُ ٱلْقُرَىٰٓ أَن يَأْتِيَهُم بَأْسُنَا بَيَـٰتًا وَهُمْ نَآئِمُونَ ﴿٩٧﴾ أَوَأَمِنَ أَهْلُ ٱلْقُرَىٰٓ أَن يَأْتِيَهُم بَأْسُنَا ضُحًى وَهُمْ يَلْعَبُونَ ﴿٩٨﴾ أَفَأَمِنُوا۟ مَكْرَ ٱللَّهِ ۚ فَلَا يَأْمَنُ مَكْرَ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْخَـٰسِرُونَ ﴿٩٩﴾ أَوَلَمْ يَهْدِ لِلَّذِينَ يَرِثُونَ ٱلْأَرْضَ مِنۢ بَعْدِ أَهْلِهَآ أَن لَّوْ نَشَآءُ أَصَبْنَـٰهُم بِذُنُوبِهِمْ ۚ وَنَطْبَعُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ ﴿١٠٠﴾ تِلْكَ ٱلْقُرَىٰ نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنۢبَآئِهَا ۚ وَلَقَدْ جَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَـٰتِ فَمَا كَانُوا۟ لِيُؤْمِنُوا۟ بِمَا كَذَّبُوا۟ مِن قَبْلُ ۚ كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿١٠١﴾ وَمَا وَجَدْنَا لِأَكْثَرِهِم مِّنْ عَهْدٍ ۖ وَإِن وَجَدْنَآ أَكْثَرَهُمْ لَفَـٰسِقِينَ ﴿١٠٢﴾ ثُمَّ بَعَثْنَا مِنۢ بَعْدِهِم مُّوسَىٰ بِـَٔايَـٰتِنَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِي۟هِۦ فَظَلَمُوا۟ بِهَا ۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿١٠٣﴾ وَقَالَ مُوسَىٰ يَـٰفِرْعَوْنُ إِنِّى رَسُولٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٠٤﴾

١٦٣

گوندو شارانە بڕوایان هێنابا و، لە خوا ترسیان بووباو کاریان بەبەرنامەی ئەوکردبا ﴿لفتحنا علیهم برکات من السماء والأرض﴾ ئێمەش دەرگای گشت خێرو پیتێکی ئاسمان و زەوییمان بەڕوویاندا والاّ دەکردو "لە ئاسمان وزەوی ڕسقمان دەدا، دیارە خەڵکانی شارنشین زیاتر بەهۆی ڕابواردن و سەرگەرم بوونیانەوە بەدونیاوە، هەرکەمێکیان بڕوایان دەهێنا و بەرەو هەق دەهاتن ، وەکو لەجێگایەکی تردا دەفەرموێ: (فلولا کانت قریة آمنت فنفعها إیمانها إلا قوم یونس..) ٩٨/١٠.. یان دەفەرموێ: (فآمنوا فمتعناهم إلی حین) ١٤٨/٣٧.. یان دەفەرموێ: (وماأرسلنا فی قریة من نذیر..) ﴿ولکن کذبوا﴾ بەلاّم لەباتی ئیمان، ئەوانە هەرملیان نەداو بڕوایان بە پەیامبەرەکان نەکردو بە درۆزنیان دانان ﴿فاخذناهم بما کانوا یکسبون﴾ ئینجا ئێمەیش بەهۆی کارە خراپەکانیانەوە بەسەختی گرتمانن ﴿[٩٧] افامن اهل القری ان یأتیهم بأسنا بیاتا وهم نائمون﴾ ئاخۆ ئەو خەڵکی گوندو شارانە "کە بڕوا ناهێنن"

دڵنیان لەوە کە بەشەودا بەڵای ئێمەیان تووش نابێ و، بۆخۆشیان هەرلەخەوا بن؟ ﴿٩٨ او امن اهل القرى ان يأتيهم بأسنا ضحى﴾ ئاخۆ ئەو خەڵکی شارو گوندنشینانە ئەمینبن لەوە کە لەدەمی چێشتەنگاودا سزایان بۆ بێ ﴿وهم يلعبون﴾ ولە گەرمەی گەمەو گاڵتەدابن ؟ ﴿٩٩ افأمنوا مكر الله﴾ بڵێیت لەمەکرو هێزو دەسەڵات و سزای خوا دڵنیابن؟ کە چۆن زۆر لەسەرخۆ لە بنیان دێنێ و خافڵیشن ﴿فلا يأمن مكر الله إلا القوم الخاسرون﴾ خۆ مەگەر هەر گەل وهۆزی زیانمەندان لە مەکرو تۆڵەی خوا دڵنیابن ﴿١٠٠ او لم يهد للذين يرثون الأرض من بعد اهلها﴾ ئاخۆ ئەوانە ئەم زەوییەیان بەمیرات بۆدەمێنێتەوە ، دوای لەناوبردنی خەڵکەکەی، نەیانزانیوە ﴿ان لو نشاء اصبناهم بذنوبهم﴾ کە ئەگەر ئارەزوومان هەبێ ، لەدوای لەناوبردنی پێشووەکان، ئەمانیشمان بەهۆی گوناهەکانیانەوە لەناودەبردن ، هەروەك پێشووەکانی ئەوانمان بەهۆی لاساریی و لادانی خویانەوە دووچارکرد ﴿ونطبع على قلوبهم﴾ و مۆریش بەسەر دڵیاندا دەنێین ﴿فهم لا يسمعون﴾ ئیتر هیچ پەندو ئامۆژگارییەك وەرنەگرن و نەبیسن. بەڵکو هەر بەرەو سەرکەشی مل بنێن. وەك خوای گەورە لەچەند جێگایەکی تردا ئەو راستییە دووپات دەکاتەوەو دەفەرموێ: (افلم يهد لهم كم أهلكنا من قبلهم من القرون يمشون فى مساكنهم)٣٢/٢٦، یان دەفەرموێ: (أولم تكونوا اقسمتم من قبل ما لكم من زوال) ١٤/٤٤، یان دەفەرموێ: (وكم أهلكنا من قبلهم من قرن هل تحس منهم من أحد..) ١٩/٩٨، یان دەفەرموێ: (فكأين من قرية أهلكناها وهي ظالمة وهى خاوية على عروشها وبئر معطلة وقصر مشيد)٢٢/٤٥.

﴿١٠١ تلك القرى نقص عليك من انبائها﴾ ئێمە برێك لە هەواڵی ئەم شارو گوندانەت "کە وێرانمان کردن"بۆباس دەکەین هەر لە گوندەکانی (نووح)ەوە هەتا مەدیەنی شوعەیب"، تا دەرکەوێ کە ئێمە هەمیشە یارمەتی پەیامبەرەکانمان داوەو ستەمکارانیشمان لەناو بردووە. ﴿لقد جاءتهم رسلهم بالبينات﴾ سوێند دەخۆم پەیامبەرگەلێکیان بە چەندین بەڵگەو نیشانەی ڕوونەوە بۆهاتن بۆرێنمایی وشارەزاکردنیان ، وەك لە شوێنی تردا دە فەرموێ: (وما كنا معذبين حتى نبعث رسولا)١٧/١٥، یان دەفەرموێ:(ذلك من أنباء القرى نقصه عليك منها قائم وحصيد) بۆ دووپاتی ئەو راستیانە. ﴿فما كانوا ليؤمنوا بما كذبوا من قبل﴾ کەچی" لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگانەشدا" وەك لە پێشدا بڕوایان نەبوو، هەروا- بۆ دواییش- بڕوایان نەهێنا ﴿كذلك يطبع الله على قلوب الكافرين﴾ خوائابەو شێوەیە مۆردەخاتە سەر دڵی گشت بێ بڕواکان "ئیترهیچ خێرێك ناچێتە دڵیانەوە.

**سەرگوزەشتەی ( مووسا ) و فیرعەون:**

﴿١٠٢ وما وجدنا لأكثرهم من عهد﴾ خۆ زۆربەی ئەوانەشمان بە وەفادارو بەئەمەك نەدی، هەتا بەڵێنەکانیان ئەنجام بدەن، واتە: پەیمان شکێنیان کردو، زۆریش بێ ئەمەك دەرچوون، ئەوسا لە بەر ئەوە ئێمەیش لەناومان بردن، وەك لە شوێنی تردا بۆ دووپاتی ئەو راستیە دەفەرموێ: (ولقد بعثنا فى كل أمة رسولا أن اعبدوا الله واجتنبوا الطاغوت) ١٦/٣٦. ﴿وان وجدنا اكثرهم لفاسقين﴾ بێگومان زۆربەشیانمان "بەفاسق" و سنووربەزێن دیت و، پەیمانی خۆیانیان شکاند ﴿١٠٣ ثم بعثنا من بعدهم موسى بآياتنا إلى فرعون وملأه﴾ لە پاش ئەوپێغەمبەرانەوە:- نووح، هوود، صالح، شوعەیب- (مووسا)شمان بە چەند نیشانەیەکی ئاشکراوە نارد بۆ لای(فیرعەون)ی" پاشای میسر" ودەسەڵاتدارەکانی ئەو ﴿فظلموا بها﴾ کەچی"لەبەرئێرەیی وعینادیان" بە بەڵگەکانمان بڕوایان نەکردو دژیان وەستان ﴿فانظر كيف كان عاقبة المفسدين﴾ جا تەماشا بکە، بزانە پاشە ڕۆژی ئەو خراپکارانە چۆن بوو؟ ئایا هەموویانمان لەدەریاکەدا نەخنکان ؟! ﴿١٠٤ وقال موسى يا فرعون﴾ موساش وتی: ئەی فیر عەون! ﴿إني رسول من رب العالمين﴾ بێگومان من ڕاسپاردەی پەروەردگاری گشت جیهانەکانم ﴿١٠٥ حقيق على ان لا اقول على الله إلا

الحق﴾ واشرەوایە بۆ من کە هەر شتێ ڕاست و دروست بێ بۆخوا هەرئەوە بڵێم، واتە: چۆن شایستەی خوایەتی خۆیبێ، زیادو کەم نەڵێم ﴿قد جئتکم ببینة من ربکم﴾ دەساوا لە پەروەردگارتانەوە بە بەڵگەیەکی زۆر ڕوون و ئاشکراوە هاتوومەتە لاتان ﴿فأرسل معی بنی إسرائیل﴾ فیرعەون! دەبێ تۆش بەنی ئیسرائیلییەکانم لە گەڵ بنێریی و، لە کۆیلایەتی بەرەڵلایان بکەیت، تا بیانبەم بۆ (بیت المقدس) ﴿١٠٦ قال إن کنت جئت بآیة فأت بها﴾ فیرعەن وتی: باشە! ئەگەر نیشانەو بەڵگەیەکت لەگەڵ خۆت هێناوە، وەك خۆت ئەڵێیت، دەسا بیهێنە بزانین چیە ؟﴿إن کنت من الصادقین﴾ ئەگەر ڕاستە پەیامبەرییت ﴿١٠٧ فالقی عصاه﴾ جا مووسا عەساکەی خۆی فڕێدایە زەویی ﴿فإذا هی ثعبان مبین﴾ لەناکاو بووبە ئەژدیهایەکی گەورەی ئاشکرا. (ئیبن عەباس) ئەڵێت: دەمی دڕیبوویەوەو بە پەلە بەرەو ڕووی فیرعەون چوو، ئەویش کە دیتی وا بەرەو ڕووی دێت، لە ترسانا لەسەر تەختەکەی خۆی فڕێداو، دەستە دامێنی مووسا بوو-عليه السلام-کە بەڵکو وازی لێ بێنێت، ئەو جا مووساش مارەکەی گرت و بوویەوە بە عەساکەی جاران!. زمانەوانەکان دەڵێن:(ثعبان) بە نێرەمارێکی گەورە دەڵێن.

﴿١٠٨ ونزع یده﴾ جگە لەوەش دەستی خۆیشی لە گیرفانی خۆی، هێنایەدەر ﴿فإذا هی بیضاء للناظرین﴾ دەبینن کتووپڕ بۆتە نورێکی سپیی و بێخەوش بۆ تەماشا کەران .(ئیبن عەباس) دەڵێت:دەستی "وەك تیشکی خۆر" نێوان ئاسمان و زەویی ڕووناککردوە، بێ ئەوە هیچ جۆرە نەخۆشیەکی هەبێ، وەکو نەخۆشی بەڵەکی ونەخۆشیەکانی تر.

سُورَةُ الأعرَاف — الجزء التاسع

حَقِيقٌ عَلَىٰٓ أَن لَّآ أَقُولَ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْحَقَّ قَدْ جِئْتُكُم
بِبَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ فَأَرْسِلْ مَعِىَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿١٠٥﴾ قَالَ إِن كُنتَ
جِئْتَ بِـَٔايَةٍ فَأْتِ بِهَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١٠٦﴾ فَأَلْقَىٰ
عَصَاهُ فَإِذَا هِىَ ثُعْبَانٌ مُّبِينٌ ﴿١٠٧﴾ وَنَزَعَ يَدَهُۥ فَإِذَا هِىَ بَيْضَآءُ
لِلنَّٰظِرِينَ ﴿١٠٨﴾ قَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِ فِرْعَوْنَ إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٌ
عَلِيمٌ ﴿١٠٩﴾ يُرِيدُ أَن يُخْرِجَكُم مِّنْ أَرْضِكُمْ فَمَاذَا تَأْمُرُونَ ﴿١١٠﴾
قَالُوٓا۟ أَرْجِهْ وَأَخَاهُ وَأَرْسِلْ فِى ٱلْمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ﴿١١١﴾ يَأْتُوكَ
بِكُلِّ سَٰحِرٍ عَلِيمٍ ﴿١١٢﴾ وَجَآءَ ٱلسَّحَرَةُ فِرْعَوْنَ قَالُوٓا۟ إِنَّ
لَنَا لَأَجْرًا إِن كُنَّا نَحْنُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴿١١٣﴾ قَالَ نَعَمْ وَإِنَّكُمْ
لَمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿١١٤﴾ قَالُوا۟ يَٰمُوسَىٰٓ إِمَّآ أَن تُلْقِىَ وَإِمَّآ أَن
نَّكُونَ نَحْنُ ٱلْمُلْقِينَ ﴿١١٥﴾ قَالَ أَلْقُوا۟ فَلَمَّآ أَلْقَوْا۟ سَحَرُوٓا۟
أَعْيُنَ ٱلنَّاسِ وَٱسْتَرْهَبُوهُمْ وَجَآءُو بِسِحْرٍ عَظِيمٍ ﴿١١٦﴾
الحزب ١٧ ۞ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنْ أَلْقِ عَصَاكَ فَإِذَا هِىَ تَلْقَفُ مَا
يَأْفِكُونَ ﴿١١٧﴾ فَوَقَعَ ٱلْحَقُّ وَبَطَلَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١١٨﴾ فَغُلِبُوا۟
هُنَالِكَ وَٱنقَلَبُوا۟ صَٰغِرِينَ ﴿١١٩﴾ وَأُلْقِىَ ٱلسَّحَرَةُ سَٰجِدِينَ ﴿١٢٠﴾

قالوا أءامنا ١٦٤

### مووسا دەکەنە جادووگەر!:

﴿١٠٩ قال الملأ من قوم فرعون﴾ پیاوە ناودارەکانی هۆزەکەی فیرعەون وتیان: ﴿إن هذا لساحر علیم﴾ بە ڕاستیی ئەم موسایە جادووگەرێکی زۆر زاناو بە مەهارەتەو، هەر بەو جادوویەش ﴿١١٠ یرید ان یخرجکم من ارضکم﴾ ئەیەوێ گشتتان لەم وڵاتی خۆتانە" میسر"دەرپەڕێنێ ﴿فماذا تامرون﴾ جائێستا فەرمانتان بە چیە؟ ﴿١١١ قالوا ارجه واخاه﴾ ئەوانیش بە فیرعەونیان وت: تۆ خۆیی و(هاروون)ی برای لای خۆت گل بدەوە با لەلای خۆتبن و، هیچ شتێکیان بەرامبەر مەکە ﴿وأرسل فی المدائن حاشرین﴾ وکۆ کەرەکانیش بنێرە بۆ تەواوی شارەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆت ، باهەرچی جادووگەرە هەمووکۆ بکەنەوەو بیانهێنن ﴿١١٢ یأتونك بکل ساحر علیم﴾ تا هەرچی جادووگەری دەسەڵاتدارو زۆر زانە بێنن بۆلات ﴿١١٣ وجاء السحرة فرعون﴾ ناردیان و جادووگەرەکان هەموو هاتنە لای فیرعەون ﴿وقالوا إن لنا لأجرا إن کنا نحن الغالبین﴾ و وتیان: باشە! ئەگەر ئێمە زاڵبووین و سەرکەوتین بەسەر موسادا، دەبێ تۆ مزەو کرێیەکی باشمان بۆ دابنێیت و خەڵاتمان بکەیت؟ ﴿١١٤ قال نعم﴾ فیرعەون وتی: بەڵێ باشە ﴿وإنکم لمن المقربین﴾ بێگومانیشبن لەنزیکان و دەستەی مەشوەرەت و تایبەتمەندانی خۆم دەبن ﴿١١٥ قالوا یا موسی إما ان

﴿تلقى﴾ ئەوجا جادووگەرەكان وتیان: ئەی موسا! یا تۆ"بەرلەئێمە"عەساكەت بهاوێژە ﴿وإما ان نكون نحن الملقين﴾ یان ئێمە پێش تۆ دەیهاوێژین؟ لەوە دەچوو پێیانخۆش بێت دەست بخەنە پێش ﴿١١٦ قال القوا﴾ موسا وتی: دەئێوە بهاوێژن ﴿فلما القوا سحروا اعين الناس﴾ جاكە ئامێری جادووەكەی خۆیانیان هاویشت، خەڵكەكەیان چەواشەو چاوبەستكردو، پێیان وابوو ئەو شتانە"ئەوان هەڵیان داون"هەموو مارن ﴿واسترهبوهم﴾ بۆیە ترسان و، ترسێكی بەتین كەوتە دڵیانەوە ﴿وجاؤا بسحر عظيم﴾ لەراستیشدا لە پێش چاو ئەوانەوە جادوویەكی زۆر گەورەو مەزنیان نواند، چونكە هەر كەسێك دیتبای دەهاتە لەرزەو ئەترسا.

**مووسا سەركەوت و ، جادووگەرەكان موسڵمان بوون:**

الجزء التاسع — سورة الأعراف

قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٢١﴾ رَبِّ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴿١٢٢﴾ قَالَ
فِرۡعَوۡنُ ءَامَنتُم بِهِۦ قَبۡلَ أَنۡ ءَاذَنَ لَكُمۡۖ إِنَّ هَٰذَا لَمَكۡرٞ مَّكَرۡتُمُوهُ
فِي ٱلۡمَدِينَةِ لِتُخۡرِجُواْ مِنۡهَآ أَهۡلَهَاۖ فَسَوۡفَ تَعۡلَمُونَ ﴿١٢٣﴾ لَأُقَطِّعَنَّ
أَيۡدِيَكُمۡ وَأَرۡجُلَكُم مِّنۡ خِلَٰفٖ ثُمَّ لَأُصَلِّبَنَّكُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿١٢٤﴾
قَالُوٓاْ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ ﴿١٢٥﴾ وَمَا تَنقِمُ مِنَّآ إِلَّآ أَنۡ ءَامَنَّا
بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا لَمَّا جَآءَتۡنَاۚ رَبَّنَآ أَفۡرِغۡ عَلَيۡنَا صَبۡرٗا وَتَوَفَّنَا مُسۡلِمِينَ
﴿١٢٦﴾ وَقَالَ ٱلۡمَلَأُ مِن قَوۡمِ فِرۡعَوۡنَ أَتَذَرُ مُوسَىٰ وَقَوۡمَهُۥ لِيُفۡسِدُواْ
فِي ٱلۡأَرۡضِ وَيَذَرَكَ وَءَالِهَتَكَۚ قَالَ سَنُقَتِّلُ أَبۡنَآءَهُمۡ وَنَسۡتَحۡيِۦ
نِسَآءَهُمۡ وَإِنَّا فَوۡقَهُمۡ قَٰهِرُونَ ﴿١٢٧﴾ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِ
ٱسۡتَعِينُواْ بِٱللَّهِ وَٱصۡبِرُوٓاْۖ إِنَّ ٱلۡأَرۡضَ لِلَّهِ يُورِثُهَا مَن
يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦۖ وَٱلۡعَٰقِبَةُ لِلۡمُتَّقِينَ ﴿١٢٨﴾ قَالُوٓاْ أُوذِينَا
مِن قَبۡلِ أَن تَأۡتِيَنَا وَمِنۢ بَعۡدِ مَا جِئۡتَنَاۚ قَالَ عَسَىٰ رَبُّكُمۡ
أَن يُهۡلِكَ عَدُوَّكُمۡ وَيَسۡتَخۡلِفَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ
فَيَنظُرَ كَيۡفَ تَعۡمَلُونَ ﴿١٢٩﴾ وَلَقَدۡ أَخَذۡنَآ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ
بِٱلسِّنِينَ وَنَقۡصٖ مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٣٠﴾

١٦٥

﴿١١٧ واوحينا إلى موسى﴾ وەحیمان كرد بۆ مووسا ﴿ان الق عصاك﴾ كە تۆش داردەستەكەت بهاوێژە ﴿فإذا هي تلقف ما يافكون﴾ جا ئەویش هاویشتیی و، هەرچی كەرەسەی جادووی ئەوان بوو هەڵی لووشی ﴿١١٨ فوقع الحق وبطل ما كانوا يعملون﴾ ئینجاهەق و ڕاستیی دەركەوت و، هەرچی كاری پڕوو پووچی ئەوانبوو چرووك بوو ﴿١١٩ فغلبوا هنالك﴾ هەر لەوێشدا فیرعەون و داردەستەكەی ژێركەوتن و تێك شكێنران ﴿وانقلبوا صاغرين﴾بە سەرشۆڕیی وتێشكاوی گەڕانەوە ﴿١٢٠ والقى السحرة ساجدين﴾ جادووگەرەكانی فیرعەونیش گشت باوەڕیان هێناوسوژدەیان برد، كە ئەوەیان لەمووسا دی ﴿١٢١ قالوا آمنا برب العالمين﴾ وتیان: وا باوەڕمان بەپەروەردگاری جیهانەكان هێنا ﴿١٢٢ رب موسى و هارون﴾ كە پەروەردگاری (مووسا)و (هاروون) یشە ﴿١٢٣ قال فرعون آمنتم به قبل ان آذن لكم﴾ فیرعەون وتی: چۆن پێش ئەوە من مۆڵەتتان بدەم، ئێوە بڕواتان بە مووسا هێناوە؟! ﴿إن هذا لمكر مكرتموه في المدينة﴾ بێگومان ئەم كارەی ئێوە پیلانێكە "بەرلەوە بێنە ئەم گۆڕەپانەوە" لە شاردا سازاندوتانە ﴿لتخرجوا منها اهلها﴾ هەتا هاوڵاتە (قیبتیەكانی) لێدەرپەڕێنن و، لەباتی ئەوان هۆزەكەی خۆتی تیا نیشتەجێ بكەن ﴿فسوف تعلمون﴾ لەمەو پاش چاك ئەزانن چیتان پێ ئەكەم.

**مووسا بەر هەڕەشەی فیرعەون دەكەوێ:**

﴿١٢٣ لاقطعن ایدیكم وارجلكم من خلاف﴾ دڵنیابن دەستی ڕاست و، پێی چەپتان ئەبڕم ﴿ولأصلبنكم اجمعين﴾ هەمووشتان لەدار ئەدەم و ئەتانكەمە عیبرەت . (ئیبن عەباس) ئەڵێ: دەست و پێ بڕین و لەقەنارەدان ، فیرعەون دایهێنا ﴿١٢٥ قالوا إنا إلى ربنا منقلبون﴾ جادووگەرەكانیش وتیان: گرنگ نییە، چوون ئێمە هەر بۆلای پەروەردگارمان دەچینەوە، تۆش چیت لەدەست دێ بیكەو درێغی مەكە ﴿١٢٦ وما تنقم منا﴾ دیارە تۆش هەرلەبەر

ئەمە ركت لێمانەو عەزیەتمان دەكەیت ﴿إلا أن آمنا بآيات ربنا لما جاءتنا﴾ كە كاتێ ئایەت و بەڵگەكانی پەروەردگارمان بۆمان هاتن، باوەڕمان پێ هێنان ﴿ربنا أفرغ علينا صبرا﴾ دەسا ئەی خوای پەروەردگارمان! ئارامیی و تابشتمان بە سەردا برێژە ﴿وتوفنا مسلمين﴾ و بە موسڵمانەتیش بمانمرێنە، واتە: هێزی ئیمان لەدڵماندا تۆكمە بكە، هەتا بەرگەی ئەشكەنجەو ئازاری فیرعەون بگرین. (ئیبن عەباس) "خوا لێی ڕازی بێت" دەڵێت: ئەوانە كە فیرعەون لە قەنارەیدان پێش نیوەڕۆكەی جادووگەرو كافر بوون، كەچی بۆ ئێوارەكەی بوونە شەهیدی ڕێگای خواو سەربڵند بوون.

### دەستەوبەستەكەی فیرعەون دەكەونە قەلاچۆ كردنی نەوەكانی ئیسرائیل:

﴿١٢٧ وقال الملأ من قوم فرعون﴾ پیاوە ناودارەكانی هۆزەكەی فیرعەون بەویان وت: ﴿أتذر موسى قومه﴾ ئاخۆ تۆ واز لە مووساو گەلەكەی دێنی ﴿ليفسدوا في الأرض﴾ هەتا بە ئازادانە دەست بكەنە ئیفسادو گێرەشێوێنیی و ئەم وڵاتەت لێ تێك بدەن؟ ﴿ويذرك وآلهتك﴾ ودەست لەپەرستنی خۆت و پەرستراوەكانت هەڵگرێ و نەیانپەرستێ ؟ ﴿قال سنقتل أبناءهم﴾ فیرعەونیش وتی: ناهێڵین دەرچن، چونكە بەم زووییە نێرینەو كوڕەكانیان دەكوژین و بنە بڕیان دەكەین ﴿ونستحي نساءهم﴾ و ژنەكانیشیان بۆ ڕاژەو كارەكەریی و خزمەتگوزاریی دەهێڵینەوە ﴿وإنا فوقهم قاهرون﴾ خۆ بێگومانیشە ئێمە بەسەریاندا زاڵ و سەكەوتوو دەبین و لە دەستمان دەرناچن ﴿١٢٨ قال موسى لقومه﴾ ئەوسا موساش "دوای ئەو هەڕەشەو گوڕەشانە" بەهۆزەكەی خۆی وت: ﴿استعينوا بالله واصبروا﴾ هەر لەخوا یارمەتی بخوازن و، پەنا هەر بەخوا بەرن و بەئارام و خۆڕاگریشبن ﴿إن الأرض لله﴾ بێگومان ئەم گۆی زەویە ماڵ و موڵكی خوایە ﴿يورثها من يشاء من عباده﴾ حەز بە هەركەسێك لەبەندەكانی خۆی بكاو شیاویشبێ، میراتیەتی ئەو زەویەی دەداتێ و، دەیكاتە میراتبەریی ﴿والعاقبة للمتقين﴾ وپاشەڕۆژی باش و ڕووناكیش هەربۆ پارێزگارانە ﴿١٢٩ قالوا أوذينا من قبل أن تأتينا﴾ بەنی ئیسرائیلییەكان بەموسایان وت: تۆ پێش ئەوە بێیتە لامان، ئێمە هەرئەشكەنجەو ئازار دەدراین و ئیسراحەتمان بەخۆمانەوە نەدیتوو نەحەواینەوە، چونكە بەر لە دایكبوونت نێرینەكانمان دەكوژران و، مێیینەكانیشمان دەكرانە كارەكەر ﴿ومن بعد ما جئتنا﴾ دوای هاتنیشت هەرئەو ئازارو سزایە دراین و چەوساینەوە، ئیتر نازانین كەی ڕزگار دەبین؟! ﴿قال عسى ربكم أن يهلك عدوكم﴾ موسا وتی: بێگومانە كە پەروەردگارتان دوژمنتان لەناو دەبات. (تەبەریی) دەڵێ: (عسى من الله واجب) واتە: گشت كردارەكانی ((عسى)) لەقورئاندا بۆحەتمییەتە ﴿ويستخلفكم في الأرض﴾ و ئێوە دەخاتە جێی ئەوان لەم وڵاتەدا ﴿فينظر كيف تعملون﴾ ئەوجا ببینێ ئێوەش چۆن ڕەفتار دەكەن؟

### ئالی فیرعەون بەر قات وقڕی دەخەین:

﴿١٣٠ ولقد أخذنا آل فرعون بالسنين ونقص من الثمرات﴾ بەڕاستی بەگرانیی و وشكەساڵیی و كەم بوونی بەرووبووم و، میوەجات و داهات، قارمان لە دەستەو بەستەی فیرعەون گرت ﴿لعلهم يذكرون﴾ تا بەشكو داچڵەكێن و بە خۆبەر بێنەوەو پەند وەرگرن ﴿١٣١ فإذا جاءتهم الحسنة﴾ كەچی هەر كە هەرزانیی و خۆشگوزەرانیان بۆهاتبا ﴿قالوا لنا هذه﴾ لەباتی شوكرانە بژێری دەیانگوت: ئەمە لەبەرشان وحاڵی خۆمانە! ﴿وإن تصبهم سيئة يطيروا بموسى ومن معه﴾ خۆئەگەر پاش ئەوخۆشگوزەرانیە هەر گرانیی و ناخۆشیەكیان تووش هاتبا، لەمووساو لەوخەڵكەی لەگەڵیا بوون، ڕەشبین دەبوون ﴿ألا إنما طائرهم عند الله﴾ هوشیاربن! ئەوی لە قازانج ولە زیانیان بێت، هەر بەبڕیاری خوایە، نەك لەبەر شوومی مووساو ئەوانە بێ لەگەڵی بوون ﴿ولكن أكثرهم لا يعلمون﴾ بەڵام زۆربەیان

ئەم ڕاستیە نازانن ﴿[١٣٢] وقالوا مهما تأتنا به من آية﴾پاش هێنانی بەڵگەو نیشانەیەکی زۆر لەلایەن مووساوە پێیانگوت: موسا! هەر ئایەت و بەڵگەیەکمان بۆبهێنیت ﴿لتسحرنا بها﴾ هەتا جادوومان لێ بکەیت و، چاو بەسمانی پێبکەیت و، بتەوێ لەو حاڵە لامان بدەیت ﴿فما نحن لك بمؤمنين﴾ هەر باوەڕت پێناکەین.

**خوا قاری لەگەڵەکەی فیرعەون گرت:**

﴿[١٣٣] فارسلنا عليهم الطوفان والجراد﴾ ئینجا ئێمەیش بارانێکی بەتۆفان و بە لێزەمەو، کوللەمان نارده سەریان بۆ لەناوبردنی خۆیان و، فەوتاندنی کشتوکاڵ و مەزراکانیان . لە (سونەنی ئەبووداود/ کتاب الأطعمة ٣٥٧/٣)دا هاتووە: لەپێغەمبەریان ﷺ پرسی سەبارەت بەخواردن و نەخواردنی کوللە، لە وەڵامدا فەرمووی: ((اکثر جنود الله، لا آكله، ولا أحرمه)) کوللە فرەترینی سوپاکانی خوایە، نەدەی خۆم و نە حەرامیشی دەکەم.﴿والقمل﴾ (سوون)یشمان نارده سەریان، دانەوێڵەکەیانی دەخوارد و کەڵکی نەدەما، وەیان گەنەو ئەسپێمان تێبەردەدان، هەتا خۆیان و ئاژەڵەکانیان ئازار بدەن ﴿والضفادع﴾ (بۆق)یشمان نارده سەر کاسەو کەوێڵیان" ﴿والدم﴾ و خوێنمان کردە سزایان ، بەزۆری خوێنی لووتیان بەر ئەبوو، یان کانی ئاوەکانیان پڕ دەبوو لە خوێن" وە یان گەلێکیان خوێنی لە شیان بەردەبوو، وە یان خوێنیان پیس دەبوو و تووشی فشار دەبوون، وە یان خوێنیان فیشقەی دەبەست و تووشی ئیفلیجی دەبوون. ﴿آيات مفصلات﴾ گشت ئەمانە ئایەت و نیشانەی ڕوون و ئاشکراولێکجیان، بۆ ڕاستیی مووسامان ناردن ﴿فاستكبروا وكانوا قوما مجرمين﴾ کە چی دەعیەو فیزگرتنیی وئیمانیان نەهێناو، لەبنەڕەتدا گەلێکی تاوانکارو تاوانباربوون بۆیە ئەوەندە یاخیی ولاساربوون ﴿[١٣٤] ولما وقع عليهم الرجس﴾ هەرکە ئەوسزایە هاتە سەریان و بە چاودیتیان ﴿قالوا ياموسى ادع لنا ربك﴾ وتیان ئەی موسا! لە پەروەردگارت بخوازەو بپاڕێرەوە ﴿بما عهد عندك﴾ لە بەر پەیمانێك کە لەگەڵ تۆدا کردوویەتی لەبەر ئەوپلەی پەیامبەرێتیە پێیداوی ﴿لئن كشفت عنا الرجز﴾ دڵنیابە ئەگەر ئەو سزایەت لەسەر لابردین ﴿لنؤمنن لك﴾ مەرجبێ باوەڕت پێ بێنین ﴿ولنرسلن معك بنى إسرائيل﴾ و نەوەکانی یەعقوبیشت لەگەڵ بنێرین، واتە: ئێمە وازیان لێی دێنین و تەسلیم دەبین ﴿[١٣٥] فلما كشفنا عنهم الرجز﴾ کەچی کاتێ سزاکەمان لەسەرلادان ﴿إلى اجل هم بالغوه﴾ تا ئەو ماوە دیارییکرابوو بۆ لەناو بردن و نقومکردنیان، کە ئیتر هەقبوو باوەڕ بێنن ﴿إذا هم ينكثون﴾ بۆ جارێکی تر خێرا پەیمانەکەیان دەشکاند.

الجزء التاسع — سورة الأعراف

فإذا جاءتهم الحسنة قالوا لنا هذه وإن تصبهم سيئة
يطيروا بموسى ومن معه ألا إنما طائرهم عند الله ولكن
أكثرهم لا يعلمون ﴿١٣١﴾ وقالوا مهما تأتنا به من آية
لتسحرنا بها فما نحن لك بمؤمنين ﴿١٣٢﴾ فأرسلنا عليهم
الطوفان والجراد والقمل والضفادع والدم آيات مفصلات
فاستكبروا وكانوا قوما مجرمين ﴿١٣٣﴾ ولما وقع عليهم
الرجز قالوا يا موسى ادع لنا ربك بما عهد عندك لئن
كشفت عنا الرجز لنؤمنن لك ولنرسلن معك بني
إسرائيل ﴿١٣٤﴾ فلما كشفنا عنهم الرجز إلى أجل
هم بالغوه إذا هم ينكثون ﴿١٣٥﴾ فانتقمنا منهم فأغرقناهم
في اليم بأنهم كذبوا بآياتنا وكانوا عنها غافلين ﴿١٣٦﴾
وأورثنا القوم الذين كانوا يستضعفون مشارق
الأرض ومغاربها التي باركنا فيها وتمت كلمت ربك
الحسنى على بني إسرائيل بما صبروا ودمرنا ما كان
يصنع فرعون وقومه وما كانوا يعرشون ﴿١٣٧﴾

١٦٦ وجوزنا ببني

**فیرعەونمان خنکان و، بەنی ئیسرائیل بوونە جێنشین:**

﴿١٣٦ **فانتقمنا منهم**﴾ جا ئێمەیش تۆڵەمان لێ سەندن ﴿**فأغرقناهم في اليم**﴾ و لە دەریای(نیل)دا نقوممان کردن و خنکان ﴿**بأنهم كذبوا بآياتنا**﴾ چونکە ئایەت و موجیزەکانی ئێمەیان بەدرۆ دانا ﴿**وكانوا عنها غافلين**﴾ خافڵ وگێل و بێ ئاگاشبوون لێیان، بۆیە هەوڵی بەدرۆ خستنەوەیان دەدا" ﴿١٣٧ **وأورثنا القوم الذين كانوا يستضعفون مشارق الأرض ومغاربها التي باركنا فيها**﴾ ئەوسا ئێمە خۆرهەڵات و خۆرئاوای "وڵاتی شام" کە پڕپیتمانکردبوو، کردبەش ومیراتی ئەو گەلەی بێدەسەڵات و کزو داماوکرابوون، وەکو لەشوێنێکی تردا شێوەی ئەو میرات پێدانە روون دەکاتەوەو دەفەرموێ: (كم تركوا من جنات وعيون وزروع ومقام كريم..)٤٤/٢٥-٢٦. ﴿**وتمت كلمة ربك الحسنى على بني إسرائيل**﴾ ئەوساش بەڵێن و بڕیارە زۆر پیرۆزەکەی پەروەردگارت کەفەرموو بووی (ونريد أن نمن على استضعفوا في الأرض ونجعلهم أئمة ونجعلهم الوارثين) بۆ نەوەکانی یەعقووب بەراستگەڕاو بوونە پاشاو میراتگری وڵاتی میسر ﴿**بما صبروا**﴾ چونکە بە ئارام و بەتابشتبوون بەرامبەر بەئازارەکانی فیرعەون ودام ودەزگاکانی ﴿**ودمرنا ما كان يصنع فرعون وقومه وما كانوا يعرشون**﴾ هەر بیناو کۆشك وخانوو بەرەیەکیش فیرعەون و دەستەو بەستەکەی ئەو دروستیان کردبوو، هەموومان وێران کردو کوتامان بەسەر یەکا.

**لەدەریا پەڕینەوەو بە پەیکەری (بت)ی گەیین:**

﴿١٣٨ **وجاوزنا ببني إسرائيل البحر**﴾ و نەوەکانی یەعقووبمان لە دەریای (قولزم) - کەئێستا کەنداوی (سویس)ی پێ ئەڵێن - پەڕاندەوە ﴿**فأتوا على قوم يعكفون على أصنام لهم**﴾ ئەو ساهاتنە لای کۆمەڵ و قەومێك ، کە هەردەم خەریکی پەرستنی بتەکانیان بوون و کڕنۆڵەیان لە بەردەمیاندا کردبوو ﴿**قالوا يا موسى إجعل لنا إلها**﴾ وتیان: موسا! دەسا تۆش خوایەکمان بۆ پەیداکە "با بیپەرستین" ﴿**كما لهم آلهة**﴾ وەکو ئەوانە چەند خوایەکیان بۆخۆیان داناوەو دەیانپەرستن ﴿**قال إنكم قوم تجهلون**﴾ موساش وتی: بە ڕاستیی ئێوە گەلێکی نەفام و نەزانن، بۆیە بە گەورەیی خوا نازانن وئەوجۆرەشتانە داوا دەکەن !!. (ئەبوو واقیدی لەیسیی) دەڵێت: هاوەڵان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بەرەو (حونەین) دەرچوون و، لەرێگادا دارێکی گەورەی سەوزیان دیت و، داوایان لێکرد کە: وەکو کافرەکان دارێکی تایبەتی خۆیانیان هەیەو، دەچنە بنیی و شیعر وهۆنراوە دەڵێن و، ڕم و کەوانەکانیشیانی لێ هەڵدەواسن و، بەوکارەیان پیرۆزی دەکەن و، لەوێ قەتیس دەمێنن ! دەبا ئێمەیش ئەم دارە پیرۆز بکەین و چەکەکانمانی لێ هەڵواسین و بیپەرستین !. ئەویش فەرمووی: (الله أكبر)! ئەمە هەر لەو قسەیە دەچێ کە هۆزەکەی موسا داوایان لە موسا کردو گوتیان: (اجعل لنا إلها كما لهم آلهة قال إنكم قوم تجهلون) ((لتركبن سنن من قبلكم حذو القذة بالقذة

الجزء التاسع — سورة الأعراف

وَجَٰوَزۡنَا بِبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱلۡبَحۡرَ فَأَتَوۡاْ عَلَىٰ قَوۡمٖ يَعۡكُفُونَ عَلَىٰٓ
أَصۡنَامٖ لَّهُمۡۚ قَالُواْ يَٰمُوسَى ٱجۡعَل لَّنَآ إِلَٰهٗا كَمَا لَهُمۡ ءَالِهَةٞۚ
قَالَ إِنَّكُمۡ قَوۡمٞ تَجۡهَلُونَ ﴿١٣٨﴾ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ مُتَبَّرٞ مَّا هُمۡ فِيهِ وَبَٰطِلٞ
مَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١٣٩﴾ قَالَ أَغَيۡرَ ٱللَّهِ أَبۡغِيكُمۡ إِلَٰهٗا
وَهُوَ فَضَّلَكُمۡ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٤٠﴾ وَإِذۡ أَنجَيۡنَٰكُم
مِّنۡ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ يَسُومُونَكُمۡ سُوٓءَ ٱلۡعَذَابِ يُقَتِّلُونَ
أَبۡنَآءَكُمۡ وَيَسۡتَحۡيُونَ نِسَآءَكُمۡۚ وَفِي ذَٰلِكُم بَلَآءٞ مِّن
رَّبِّكُمۡ عَظِيمٞ ﴿١٤١﴾ ۞ وَوَٰعَدۡنَا مُوسَىٰ ثَلَٰثِينَ لَيۡلَةٗ
وَأَتۡمَمۡنَٰهَا بِعَشۡرٖ فَتَمَّ مِيقَٰتُ رَبِّهِۦٓ أَرۡبَعِينَ لَيۡلَةٗۚ وَقَالَ
مُوسَىٰ لِأَخِيهِ هَٰرُونَ ٱخۡلُفۡنِي فِي قَوۡمِي وَأَصۡلِحۡ وَلَا تَتَّبِعۡ
سَبِيلَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴿١٤٢﴾ وَلَمَّا جَآءَ مُوسَىٰ لِمِيقَٰتِنَا وَكَلَّمَهُۥ
رَبُّهُۥ قَالَ رَبِّ أَرِنِيٓ أَنظُرۡ إِلَيۡكَۚ قَالَ لَن تَرَىٰنِي وَلَٰكِنِ ٱنظُرۡ
إِلَى ٱلۡجَبَلِ فَإِنِ ٱسۡتَقَرَّ مَكَانَهُۥ فَسَوۡفَ تَرَىٰنِيۚ فَلَمَّا تَجَلَّىٰ
رَبُّهُۥ لِلۡجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكّٗا وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقٗاۚ فَلَمَّآ أَفَاقَ
قَالَ سُبۡحَٰنَكَ تُبۡتُ إِلَيۡكَ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١٤٣﴾

نصف الحزب ١٧

١٦٧

حتى لو دخلوا جحر ضب لدخلتموه)) / ترمزیی. ﴿١٣٩ إن هؤلاء متبر ما هم فيه﴾ بێگومان ئەو حاڵەتەی ئەوانی تێدایە "کەبتەکان دەپەرستن، سەرەنجامی تیاچوون و نابوودیی وهیلاکەتە ﴿وباطل ما كانوا يعملون﴾ وهەر چیش دەکەن بێ کەڵك و باتڵە، واتە: خۆیان وبتانیان دوا براون ﴿١٤٠ قال اغيرالله ابغيكم إلها﴾ مووسا وتی: باشە ئێوە دەتانەوێ جگە لەخوا، خوای ترتان بۆ بخوازم بۆپەرستن؟!﴿و هو فضلكم على العالمين﴾ کە هەر ئەویشە فەزڵتانی داوە بەسەر خەڵکانی سەردەمی خۆتاندا ﴿١٤١ وإذ نجيناكم من آل فرعون﴾ ئەمەشتان لەبیر بێت کە لە دەستی بنەماڵەو دەسەلاتدارانی فیرعەون ڕزگارمان کردن ﴿يسومونكم سوء العذاب﴾ کە سزای زۆر خراپیان پێدەچەشتن و، زەلیل و ڕیسوایان ئەکردن ﴿يقتلون ابناءكم﴾ نێرینەو کوڕەکانتانیان ئەکوشت و، بنەبڕیان ئەکردن ﴿ويستحيون نساءكم﴾ ومێینەو ژنەکانتانیان زیندە ڕائەگرت و بە یەخسیری دەیانهێشتنەوە بۆ کارەکەریی و خزمەتگوزاریی ﴿وفى ذلكم بلاء من ربكم عظيم﴾ دیارە لەوەدا تاقیکردنەوەیەکی گەورەومەزن بوو بۆتان لەلایەن پەروەردگارتانەوە ﴿١٤٢ و واعدنا موسى ثلاثين ليلة﴾ وەبەڵێنی (٣٠)شەومان بەمووساداو گوتمان دوای تێپەڕبوونی ئەو ماوەیە دەبێ بێیتە کێوی (طوور) بۆ پاڕانەوەو وەرگرتنی تەورات ﴿واتممناها بعشر﴾ وە دەشەوی تریشمان خستەسەریی وبەوە بوویە چل شەوی تەواو. بەڵێ.. موسا بەڵێنی بە هۆزەکەی خۆیدا کە ئەگەر خوا فیرعەونی دوژمنی بۆ لەناو ببات، بەرنامەیەکی تێروتەواوی ژیانیان لەلایەن خواوە بۆ دێنێ، جا کە فیرعەون و دام و دەزگاکەی تیاچوو و خنکان ، مووساش داوای لەخوا کرد کە: کتێب و نامەیەکی وای بۆ بنێرێ، خوایش -جلا جلاله- فەرمانی پێکرد کە : دەبێ (١٠) ڕۆژ لەمانگی (زیحەجە)شی بخاتە سەر، تاببێ بە چل شەوی تەواو، بۆیە دەفەرموێ: ﴿فتم ميقات ربه أربعين ليلة﴾ بەوە ماوەدیاریی کراوەکەی پەروەردگاری بوو بە چل شەو،چونکە(٣٠)شەوی مانگی زیقەعدە و، دە ڕۆژی یەکەمی مانگی زیحەجەیش چلی تەواودەکات. (ئیبن عەباس) دەڵێ: ئاخر ڕۆژی بەڵێنەکە یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربان بوو، هەر لەو ڕۆژەشدابوو خوا قسەی لەگەڵ (موسا) کرد، هەرئەو ڕۆژەیش بوو ئەم دینی ئیسلامە بە پایانگەیشت و، ئایەتی: (اليوم أكملت لكم دينكم..) هات .﴿وقال موسى لأخيه هارون﴾ مووسا بەهاروونی برای گوت: ﴿اخلفنى فى قومى﴾ هەتا لەناو نەتەوەو خزماندا دێمەوە تۆ جێنشینم بە ﴿واصلح﴾ و هەمیشەیش خەریکی چاکسازییبەو، خزمان هەر بەرەو خواببە ﴿ولا تتبع سبيل المفسدين﴾ وقەت بە ڕێی خراپکاراندا مەچۆو ئاگاداربە! دیارە ئەم ئاراستەیە بۆ دووپاتکردنەوەیە، ئەگینە هاروون پێغەمبەرەو کاری هەر چاکسازییە.

## مووسا دەخوازێ پەروەردگاری ببینێ:

﴿١٤٣ ولما جاء موسى لميقاتنا﴾ ئەوسا کە موسا هات بۆشوێنی موناجاتەکە لە گەڵمان ﴿وكلمه ربه﴾ و پەروەردگاری کەوتە قسەو گفتوگۆ لەگەڵی وگوێی لەدەنگییەوەبوو ﴿قال رب ارنى أنظر إليك﴾ موسا بۆپتر دڵنیایی وخۆشەوستیی بەپەرۆشەوە گوتی: پەروەردگارم! خۆتم پێنیشاندە، زۆر ئارەزوومە بتبینم ﴿قال لن ترانى﴾ خوا فەرمووی: مووسا! هەرگیز لەم دونیایەدا تۆ ناتوانی بمبینیێ، چونکە بونیەی ئادەمیزادی ئێستای ئەم دونیایە، توانای بینینی خوای نیە ﴿ولكن انظر إلى الجبل فإن استقر مكانه فسوف ترانى﴾ بەڵام لەم کێوە بڕوانە، من خۆمی نیشان دەدەم، جائەگەر ئەو"کەبونیەی لەتۆ بتەوترە" لە جێی خۆی ماو، نەبزووت، ئەوساش تۆدەتوانی بمبینیێ، ئەگینە نامبینی﴿فلما تجلى ربه للجبل﴾ جاهەرکە پەروەردگاری بۆ کێوەکە خۆی دەرخست ﴿جعله دكا﴾ هەر بە جارێ کێوەکەی روونـاککردەوەو هەپروون هەپرروونی کرد ﴿وخر موسى صعقا﴾ و مووساش بێهۆشکەوت و بوورایەوە ﴿فلما افاق﴾ ئینجا کە بەهۆشهاتەوە ﴿قال سبحانك تبت إليك﴾ وتی خوایا! پاك وخاوێنی و بێخەوشی

هەر بۆ تۆیە، هەر شتێکیش تۆ لەکەدار بکا، دوور ڕاتدەگرم لێیی و، پەشیمانیشم لە داواکەم ﴿وانا اول المؤمنین﴾ ومن یەکەمین کەسم لەناو بەنی ئیسرائیلییە بڕوادارەکاندا ئیمانم بە گەورەیی و دەسەڵاتی تۆیە. بەڵێ.. زۆربەی ڕاو بۆچوونی زاناکان لە سەر ئەوەیە کە: هیچ کەسێك لەم جیهانەدا خوای گەورەی نەدیتوەو نایشیبینێ، تەنانەتی دیتنەکەی پەیامبەریش ﷺ دەڵێن هەر بە دڵ بووە، نەك بە چاوی سەر. (ئیبن کەسیر) دەڵێت: بێژەی ((لن)) لەم ئایەتەی (لن ترانی)یەدا لای زۆرینەی زاناکان بۆتە کێشە، چونکە و شەی ((لن)) بۆ بەربەستکردنە لەڕوودانی هەرکارێك بە هەتاهەتایی، (نەحوو)زانەکان دەڵێن (لنفی التأبید). موعتەزیلەکانیش ئەمەیان کردوتە بە ڵگەی خۆیان کە: خوا نە لە دونیادا، نەلە پاشە ڕۆژدا نابینرێ، بەڵام ئەمە لە هەموو بۆ چوونەکان لاوازترە، چونکە گەلێ فەرموودەی (موتەواتر) هاتووە کە: موسڵمانان لەقیامەتدا خوا ئەبینن، دیسان ئایەتی (لا تدرکە الأبصار) یشیان هەر بە بینین لێکداوەتەوە، واتە: بەلای ئەوانەوە قەت خوا نابینرێ، نە لەدونیادا" نە لە پاشە ڕۆژدا، جا بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی ئەم مەسەلەوە، سەرێ لە سوورەتی (نەجم) بدە، چونکە لەوێ پترروونکراوەتەوە ﴿[١٤٤] قال یا موسی إنی اصطفیتك علی الناس برسالاتی وبکلامی﴾ بەڵێ مووسا گەیشتە میقاتەکە وخوا فەرمووی: مووسا! بێگومانبە من بەم پەیام و قسانە لەگەڵمکردیت، هەڵبژاردویی و فەزڵمدایت بەسەر ئەوخەڵکەدا ﴿فخذ ما آتیتك﴾ دەساتۆش هەرچیم پێداوی توندتوند بیگرەو کاری پێ بکە ﴿وکن من الشاکرین﴾ ولە شوکرانە بژێرانیش بە.

**بەرنامە لە چەند (تەتەڵە)یەکدا بەمووسا دەدرێ:**

﴿[١٤٥] وکتبناله فی الألواح من کل شئ﴾ وە لەو(لەوح)و تەتەڵانە، بەموسامان دان، حوکمی هەموو شتێکمان بۆ نووسیی، واتە: ئەوەی ئەوان پێویستیان پێبوو بۆمان نارد. (ئەلواح) کۆی (لەوح)ـە، مەبەست بەو تەتەڵانەیە بەرنامەو

الجزء التاسع — سورة الأعراف

قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ إِنِّي ٱصۡطَفَيۡتُكَ عَلَى ٱلنَّاسِ بِرِسَٰلَٰتِي وَبِكَلَٰمِي
فَخُذۡ مَآ ءَاتَيۡتُكَ وَكُن مِّنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ١٤٤ وَكَتَبۡنَا
لَهُۥ فِي ٱلۡأَلۡوَاحِ مِن كُلِّ شَيۡءٖ مَّوۡعِظَةٗ وَتَفۡصِيلٗا لِّكُلِّ
شَيۡءٖ فَخُذۡهَا بِقُوَّةٖ وَأۡمُرۡ قَوۡمَكَ يَأۡخُذُواْ بِأَحۡسَنِهَاۚ سَأُوْرِيكُمۡ
دَارَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ١٤٥ سَأَصۡرِفُ عَنۡ ءَايَٰتِيَ ٱلَّذِينَ يَتَكَبَّرُونَ
فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَإِن يَرَوۡاْ كُلَّ ءَايَةٖ لَّا يُؤۡمِنُواْ
بِهَا وَإِن يَرَوۡاْ سَبِيلَ ٱلرُّشۡدِ لَا يَتَّخِذُوهُ سَبِيلٗا وَإِن يَرَوۡاْ
سَبِيلَ ٱلۡغَيِّ يَتَّخِذُوهُ سَبِيلٗاۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا
وَكَانُواْ عَنۡهَا غَٰفِلِينَ ١٤٦ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَلِقَآءِ
ٱلۡأٓخِرَةِ حَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡۚ هَلۡ يُجۡزَوۡنَ إِلَّا مَا كَانُواْ
يَعۡمَلُونَ ١٤٧ وَٱتَّخَذَ قَوۡمُ مُوسَىٰ مِنۢ بَعۡدِهِۦ مِنۡ حُلِيِّهِمۡ
عِجۡلٗا جَسَدٗا لَّهُۥ خُوَارٌۚ أَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّهُۥ لَا يُكَلِّمُهُمۡ وَلَا يَهۡدِيهِمۡ
سَبِيلًاۘ ٱتَّخَذُوهُ وَكَانُواْ ظَٰلِمِينَ ١٤٨ وَلَمَّا سُقِطَ
فِيٓ أَيۡدِيهِمۡ وَرَأَوۡاْ أَنَّهُمۡ قَدۡ ضَلُّواْ قَالُواْ لَئِن لَّمۡ يَرۡحَمۡنَا
رَبُّنَا وَيَغۡفِرۡ لَنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ١٤٩

١٦٨

شەریعەتەکەی موسای تێیدا نووسرابوو ﴿موعظة﴾ تا ببێ بەپەند و ئامۆژگاریی بۆیان ﴿وتفصیلا لکل شئ﴾ و شییکەرەوەی هەموو حەڵاڵ و حەرامێك ﴿فخذها بقوة﴾ جا تۆش مووسا! زۆر بەهێزو بە توند ئەو(ئەلواح)انە بگرە ﴿وامر قومك ان یأخذوا بأحسنها﴾ فەرمان بە گەلەکەشت بدە هەرەچاکەکەیان بگرن و ڕەفتاری پێ بکەن، مەبەست ئەوەیە کەتەتەڵەکانی تەورات (حسن)و(أحسن)ی تێدایە، بۆنموونە (قصاص)و تۆڵە وەرگرتنەوە ڕێی پێدراوەو کارێکی(حسن)ە، عەفەوو لێبوردنیش هەروا، بەڵام کارێکی(أحسن)ە.دەسا ئێوە کار بە(أحسن)ەکەی بکەن. ﴿سأوریکم دار الفاسقین﴾ دڵنیاشبن خانەو لانەی سنوور بە زێنەکانتان- لە سەفەرەکانتاندا - نیشان دەدەم، ئەوسادەبینن چیمان پێکردوون.

### ئەهلی فیز لەئایەتی خوا کەڵك وەرناگرێ:

﴿١٤٦ سأصرف عن آیاتی الذین یتکبرون فی الأرض بغیر الحق﴾ بێگومان ئەو کەسانەی کەبە ناهەق لە سەرزەویی تەکەبوورو دەست درێژیی ئەکەن، لە وەرگرتنی نیشانەکانی خۆمیان لا ئەدەم و، ناهێڵم لێیان تێبگەن ﴿وإن یروا کل آیة لا یؤمنوا بها﴾ وئەگەر هەر ئایەت و بەڵگەیەکیش ببینن بۆ یەکتاپەرستیی، ئەوان هەر باوەڕی پێناکەن و بە جادووی دادەنێن! ﴿وإن یروا سبیل الرشد﴾ یان ئەگەر ڕێی بەختیاریی و سەرفرازی ببینن ﴿لا یتخذوه سبیلا﴾ وەری ناگرن و پێیداناچن. ﴿وإن یروا سبیل الغی یتخذوه سبیلا﴾ خۆ ئەگەر ڕێی خراپەکاریی و سەر لێشێواوی ببینن، خێرا وەری دەگرن و کاری پێدەکەن ! ﴿ذلك بأنهم کذبوا بآیاتنا﴾ ئەوەش چونکە ئایەتەکانی ئێمەیان بە درۆدادەنا ﴿وکانوا عنها غافلین﴾ و خافڵ و بێ ئاگاشبوون لێیان و سەرنجیان نەدانێ ﴿١٤٧ والذین کذبوا بآیاتنا ولقاء الآخرة﴾ ئەوکەسانەش نیشانەکانی ئێمە و، هاتنی دوا ڕۆژیان بەدرۆ دانا ﴿حبطت اعمالهم﴾ کارە چاکەکانیان پووچەڵ بوویەوەو لەناو چووو، هیچ سوودێکیان لێ وەرنەگرت ﴿هل یجزون إلا ما کانوا یعملون﴾ ئاخۆ بەوە نەبێت کردوویانە، سزا وجەزرەبە ئەدرێن؟.

### سەرگوزشتەی گوێرەکە پەرستنەکە:

﴿١٤٨ واتخذ قوم موسی من بعده من حلیهم عجلا جسدا له خوار﴾ پاش چوونەکەی موسا بۆ کێوی (طوور) گەلەکەی- لەخشڵ و زێڕەکەیان – گوێرەکەیەکی بە بۆڕەیان بۆخۆیان سازدا وپەرستیان ! پیاوێکی(سامریی)ناویان هەڵسا بە ئەنجامدانی ئەو کارەو سەرپەرشتی کرد، دەرنجام ئەو گوێرەکە بێ گیانەی لە شێوەی پەیکەردا لێکەوتەوەو پەرستیان ! ﴿ألم یروا انه لا یکلمهم﴾ مەگەر نەیاندی ئەو گوێرەکەیە قسەیان لەگەڵ ناکات ﴿ولا یهدیهم سبیلا﴾ و بۆ ڕێی ڕاستیش ڕێنماییان ناکات ﴿إتخذوه﴾ لەگەڵ ئەوەیشدا کردیانە خوای خۆیان!! ﴿وکانوا ظالمین﴾ و بەرامبەر بە خۆیان ستەمکاربوون و چوونە ڕیزی موشریکانەوە ﴿١٤٩ ولما سقط فی ایدیهم﴾کە ڕێی ڕاستیان لەدەستکەوت ﴿ورأوا انهم قد ضلوا﴾ و زانییان کە بەراستیی گومڕاو سەرگەردانبوون ﴿قالوا لئن لم یرحمنا ربنا﴾ پەشیمان بوونەوەو وتیان: ئەگەر پەروەردگارمان بەر میهرەبانی خۆیمان نەخا ﴿ویغفر لنا﴾ ولێمان نەبووری ﴿لنکونن من الخاسرین﴾ بێگومان لە زیانمەندان دەبین ﴿١٥٠ ولما رجع موسی إلی قومه غضبان أسفا﴾ کاتێ موسا لە کێوی(طوور) بە توڕەیی وخەفەتێکی زۆرەوە گەڕایەوە ناوهۆزەکەی ﴿قال بئسما خلفتمونی من بعدی﴾ تێیخوڕین و وتی:بەراستیی لەدوای من جێنشینێکی زۆر خراپ بوون! چۆن ئەو کارە زۆر خراپ و بەدەتانە کردو، ئاییني منتان گۆڕی؟! ﴿اعجلتم امر ربکم﴾ ئاخۆ لە بڕیارەکانی پەروەردگاری خۆتان پەلەتان کرد؟" نەتانتوانی خۆتان بگرن هەتا من چل ڕۆژەکە تەواو ئەکەم و دێمەوە؟!" و فەرمانی پەروەردگارتان دێ ﴿والقی الألواح﴾ و لە خەفەت ودڵ پەرێشانی خۆیشییدا (لەوح) وتەتەڵەکانی هاویشت وخستیی! ﴿واخذ برأس اخیه یجره إلیه﴾ قژی سەری (هاروون)ی برای گرت و بەرەو لای خۆی کێشای، وەکوهەر مرۆڤێك لە کەس وکاری خۆی توڕە ئەبێ، لەکاتی کردنی هەر کارێکی ئاوادا ﴿قال ابن أم﴾ هارون وتی: ئەی دایك براکەم ! دیارە کە (موسا)و (هاروون) برای باوك و دایکیی یەکن، بەڵام کەبەو ناوەوە بانگی ئەکات، بۆسەرنج ڕاکێشانیی و، بزواندنی هەست ونەستی برایەتیەتی، بۆیە ئەو وشەیە بەکارهێناو گوتی:دایك براکەم ﴿إن القوم استضعفونی﴾ بێگومان ئەوهۆزە گوێرەکە پەرستە زۆریان لێ سەندم و، بێ دەسەڵات و لاوازیانکردم ﴿وکادوا یقتلوننی﴾ و ئەوەندەیش ململانێم لەگەڵ کردن وەختبوو بشمکوژن ﴿فلا تشمت بی الأعداء﴾ دەسا تۆیش کارێ مەکە دڵی دوژمنانم پێخۆشکەیت ﴿ولا تجعلنی مع

﴿القوم الظالمين﴾ منيش لەگەڵ خەڵكە گوێرەكە پەرست وستەمكارەكە مەخە ، چونكە من هيچ دەسەڵاتێكم نەبوو ﴿١٥١ قال رب اغفرلي ولأخي﴾ كەبۆ مووسا دەركەوت" دەسەڵاتی هارونی تێدا نەبووە، وتی: پەروەردگارم! لە خۆم و لە براكەم خۆش ببە ﴿وأدخلنا في رحمتك﴾ و بەر بەزەيی خۆتمان بخە ﴿وأنت أرحم الراحمين﴾ وهەر ئەتۆش لە هەمووخەڵكانی ميهرەبان، بەميهرەبان تری ﴿١٥٢ إن الذين اتخذوا العجل﴾ بە ڕاستيی ئەوانەی كە گوێرەكەيان كردە خواو بەردەوامبوون لە سەر پەرستنی وەك سامريی و شوێنكەوتوانی ﴿سينالهم غضب من ربهم﴾ بە تەئكيد لە تۆڵەی ئەوەدا بەرقاروغەزەبی پەروەردگاريان دەكەون لە ئاخيرەتدا﴿وذلة في الحياة الدنيا﴾ و لە ژيانی ئەم دنيايەشدا ريسواو سەر شۆڕدەبن، ئەوە بوو بەربوونە گيانی يەكترو، يەكتريان دەكوشت ! ﴿وكذلك نجزي المفترين﴾ ئيتر هەركەسێك درۆ هەڵبەسێ ئێمە "وەكو ئەوانە"جەزرەبەو تۆڵەی دەدەين ﴿١٥٣ والذين عملوا السيئات﴾ ئەو كەسانەش گوناح وتاوانی كوفريان كرد ﴿ثم تابوا من بعدها وآمنوا﴾ لە پاشان پەشيمان بوونەوەو بڕوايان هێناو، هەتامردنيش لەسەری مانەوە ﴿إن ربك من بعدها لغفور رحيم﴾ بێگومان پەروەردگارت پاش ئەو پەشيمان بوونەوەيە، بپۆش و لێبوردەيەكی، دلۆڤان و ميهرەبانە.

سُورَةُ الأَعۡرَافِ — الجُزۡءُ التَّاسِعُ

وَلَمَّا رَجَعَ مُوسَىٰٓ إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ غَضۡبَٰنَ أَسِفٗا قَالَ بِئۡسَمَا خَلَفۡتُمُونِي مِنۢ بَعۡدِيٓۖ أَعَجِلۡتُمۡ أَمۡرَ رَبِّكُمۡۖ وَأَلۡقَى ٱلۡأَلۡوَاحَ وَأَخَذَ بِرَأۡسِ أَخِيهِ يَجُرُّهُۥٓ إِلَيۡهِۚ قَالَ ٱبۡنَ أُمَّ إِنَّ ٱلۡقَوۡمَ ٱسۡتَضۡعَفُونِي وَكَادُواْ يَقۡتُلُونَنِي فَلَا تُشۡمِتۡ بِيَ ٱلۡأَعۡدَآءَ وَلَا تَجۡعَلۡنِي مَعَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٥٠﴾ قَالَ رَبِّ ٱغۡفِرۡ لِي وَلِأَخِي وَأَدۡخِلۡنَا فِي رَحۡمَتِكَۖ وَأَنتَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿١٥١﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ ٱلۡعِجۡلَ سَيَنَالُهُمۡ غَضَبٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَذِلَّةٞ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۚ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُفۡتَرِينَ ﴿١٥٢﴾ وَٱلَّذِينَ عَمِلُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ثُمَّ تَابُواْ مِنۢ بَعۡدِهَا وَءَامَنُوٓاْ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعۡدِهَا لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١٥٣﴾ وَلَمَّا سَكَتَ عَن مُّوسَى ٱلۡغَضَبُ أَخَذَ ٱلۡأَلۡوَاحَۖ وَفِي نُسۡخَتِهَا هُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّلَّذِينَ هُمۡ لِرَبِّهِمۡ يَرۡهَبُونَ ﴿١٥٤﴾ وَٱخۡتَارَ مُوسَىٰ قَوۡمَهُۥ سَبۡعِينَ رَجُلٗا لِّمِيقَٰتِنَاۖ فَلَمَّآ أَخَذَتۡهُمُ ٱلرَّجۡفَةُ قَالَ رَبِّ لَوۡ شِئۡتَ أَهۡلَكۡتَهُم مِّن قَبۡلُ وَإِيَّٰيَۖ أَتُهۡلِكُنَا بِمَا فَعَلَ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَّآۖ إِنۡ هِيَ إِلَّا فِتۡنَتُكَ تُضِلُّ بِهَا مَن تَشَآءُ وَتَهۡدِي مَن تَشَآءُۖ أَنتَ وَلِيُّنَا فَٱغۡفِرۡ لَنَا وَٱرۡحَمۡنَاۖ وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡغَٰفِرِينَ ﴿١٥٥﴾

١٦٩

**مووسا لەتووڕەييیەكەی هێدی دەبێتەوە:**

﴿١٥٤ ولما سكت عن موسى الغضب﴾ جاكە رقەكەی مووسا هێدی بوويەوە" سەبارەت بە هارون و گەلەكەی" ﴿أخذ الألواح﴾ تەختەو تەتەڵەكانی هەڵگرتەوە" ئەوانەی كەتەوراتيان تيا نووسرابوويەوەو ئەو پەرتی كردبوون" ﴿وفي نسختها هدى ورحمة للذين هم لربهم يرهبون﴾ كە رينمايی وبەزەيی تێدا بوو بۆ ئەوانەی لە دەسەڵاتی پەروەردگاريان دەترسن، واتە: لەگەڵ ئەوەيشدا هيدايەتی ئەوانی تێدا مابوو.

**حەفتاوكەس بەنی ئیسرائیل دەچنە موناجاتی خوا:**

﴿١٥٥ واختار موسى قومه سبعين رجلا لميقاتنا﴾ ئەوسا موسا لە گەلەكەی خۆی بۆ موناجاتی خوا، حەفتا پياوی هەڵكەوتەی دەسنيشانكرد لەوانەی گوێرەكەيان نەپەرستبوو، بچنە كێوی (طوور) بۆ لێبوردن لەوانەی گوێرەكەيان پەرستبوو و پەشيمان بوونەوە، جا بۆ ئەوە لەخوا كات وژوانی وەرگرت، كەچی كاتێ گەيشتنە ئەوێ گوتيان: دەبێ بە چاوی خۆمان خوا ببينين ! ﴿فلما اخذتهم الرجفة﴾ جالە تۆڵەی ئەوەدا كە وتيان: ((أرنا الله جهرة/ دەبێ خوابببينين ئەوسا بڕوا دەهێنين)) بوومە لەرزەيەكی سەخت گرتنيی و مردن و، مووساش خەم و پەژارە دايگرت ﴿قال رب لوشئت اهلكتهم من قبل و إياي﴾ ووتی: پەروەردگارم! ئەر ئارەزووت هەبا، ئەوا پێش ئامادەبوونمان لەكيوی(طوور) گشتمانت دەمراند ﴿اتهلكنا بما فعل السفهاء منا﴾ ئايا بەهۆی كاروكردەوەی گێلە پياوو جاهيلەكانمان ، هەموومان لەناو دەبەيت ؟. ئيمامی (تەبەريی) ئەڵێت: خوا فەرمانی بە مووسا كرد كە:

کۆمەڵێك لە خەڵکەکەی بەرێ بۆ کێوی طوورو داوای لێبوردن بکەن ئەویش بردنی ، کەچی بە مووسایان وت: هەرگیز بڕوا ناکەین ئەوە خوابێ قسەت لەگەڵ ئەکا، هەتا بە چاوی سەر ئەیبینین، ئیتر لەتۆڵەی ئەوەدا تریشقەیەکی گەورە لیێدان وگشتیان مردن، جاپاش ئەوە مووسا کەوتە پاڕانەوەو وتی : پەروەردگارم! حا من کاتێ گەڕامەوە بە (بەنی ئیسرائیل) چ بڵێم لە بەرامبەر تیاچوونی ئەو حەفتا کەسەوە؟! خۆزگا منیش و ئەوانیشت بەر لەمە لەناو بردبا. (سەددیی) ئەڵێت: مووسا گریەو پاڕانەوەیەکی زۆری کرد، هەتا خوا هەموویانی زیندووکردەوە، وەك لە جێگای تردا ئەفەرموێ: (ثم بعثناكم من بعد موتكم..)٢/٥٦" ﴿إن هي إلا فتنتك﴾ خوایا! دیارە ئەو ڕووداوە هەر ئەزموون و تاقیکردنەوەی خۆتە بۆهەموومان ﴿تضل بها من تشاء وتهدی من تشاء﴾ مەیلی خۆتە هەر کەسێکی پێگومڕا بکەیت و، هەر کەسێکیش شارەزاو ڕێنمابکەیت ﴿انت ولینا﴾ تەنها هەر ئەتۆی سەرپەرست و گەورەمان ﴿فاغفر لنا وارحمنا﴾ دەسا تۆش لێمان خۆش ببەو، بەزەییت پێماندا بێتەوە ﴿وانت خیر الغافرین﴾ باشترین بەخشێنەر هەر ئەتۆی ﴿[١٥٦] واكتب لنا في هذه الدنيا حسنة وفي الآخرة﴾ لەم دونیایەو لەودونیایە" ژیانێکی خۆش و چاکمان بۆ بنووسە" ﴿إنا هدنا إليك﴾ بێگومان ئێمە بۆلای تۆ گەڕاینەوە ﴿قال عذابي اصيب به من اشاء﴾ خواش فەرمووی: مەیلم لەهەر کەسێ هەبێ سزا وجەزرەبەی خۆمی دەدەم ﴿ورحمتي وسعت كل شئ﴾ بەزەیی و میهرەبانیشم ئەوەندە زۆرە هەمووشتێکی داگرتووەو، بەشی هەمووکەسێك دەکات ﴿فسأكتبها للذين يتقون﴾ بۆ ئەوکەسانەی دەنووسم کە پارێزکاری لە گوناە وخراپە دەکەن ﴿ويؤتون الزكاة﴾ و زەکات ئەدەن ﴿والذين هم بآياتنا يؤمنون﴾ و بە ئایەت و کتێبەکانیشمان باوەڕیان هەیە.

﴿ وَٱكۡتُبۡ لَنَا فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِنَّا هُدۡنَآ إِلَيۡكَۚ قَالَ عَذَابِيٓ أُصِيبُ بِهِۦ مَنۡ أَشَآءُۖ وَرَحۡمَتِي وَسِعَتۡ كُلَّ شَيۡءٖۚ فَسَأَكۡتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلَّذِينَ هُم بِـَٔايَٰتِنَا يُؤۡمِنُونَ ١٥٦ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِيَّ ٱلۡأُمِّيَّ ٱلَّذِي يَجِدُونَهُۥ مَكۡتُوبًا عِندَهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَٱلۡإِنجِيلِ يَأۡمُرُهُم بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَىٰهُمۡ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَ وَيَضَعُ عَنۡهُمۡ إِصۡرَهُمۡ وَٱلۡأَغۡلَٰلَ ٱلَّتِي كَانَتۡ عَلَيۡهِمۡۚ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِهِۦ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَٱتَّبَعُواْ ٱلنُّورَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ١٥٧ قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيۡكُمۡ جَمِيعًا ٱلَّذِي لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ يُحۡيِۦ وَيُمِيتُۖ فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِ ٱلنَّبِيِّ ٱلۡأُمِّيِّ ٱلَّذِي يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَكَلِمَٰتِهِۦ وَٱتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمۡ تَهۡتَدُونَ ١٥٨ وَمِن قَوۡمِ مُوسَىٰٓ أُمَّةٞ يَهۡدُونَ بِٱلۡحَقِّ وَبِهِۦ يَعۡدِلُونَ ١٥٩




**صیفەتەکانی پێغەمبەرمان( موحەممەد ):**

﴿[١٥٧] الذين يتبعون الرسول النبي الأمي﴾ ئیمانداری کامڵ ئەوانەن دەکەونە شوێنی ئەو پەیامدارو هەواڵدەری خوایە، کە نەخوێندەیە، مەبەست بە (ئومیمی) کەسێکە هیچ شتێکی نەخوێندبێ و نەنووسیبێ! کەوابوو کە سێکی وەك موحەممەدﷺ لەگەڵ ئەوەیشدا نەیخوێندووە ئەو پەڕ پلەی پەیامبەرایەتی تیا بەدی دەکرێ، ئەمە مەبەستە لە وشەی (الأمی) ، نەك خوا نەخواستە مانای ئەزانین و جەهل بێ، ئیمامی (بوخاریی)یش ئەم فەرموودەیەی هێناوە: ((انا أمة أمية لا نكتب ولا نحسب)) واتە: ئێمە ئوممەتێکین نەدەنووسین و، نەحیسابگرین. ﴿الذي يجدونه مكتوبا عندهم في التوراة والإنجيل﴾ ئەو پێغەمبەرەی کە ناوو سیفەتەکانی لەتەورات ولە ئینجیلدا نووسراوەو لای خۆیان دەستیان دەکەوێ، واتە: زۆر بە چاکی دەیناسن ﴿يأمرهم بالمعروف﴾ فەرمانیان بە چاکە پێدەکا ﴿وينهاهم عن المنكر﴾ و لەشتی خراپ و ناپەسەند ڕێیان لێدەگرێت ﴿ويحل لهم الطيبات﴾ و هەمووشتێکی پاك وخاوێنیان،

بۆحەلاڵ دەكا ﴿ويحرم عليهم الخبائث﴾ وهەموو شتێكی پیس و زیانبەخشیان لێ یاساغ ئەكات، وەك شەراب و گۆشتی بەرازو ریبا...هتد ﴿ويضع عنهم إصرهم والأغلال التی كانت عليهم﴾ وبارو تەكلیفی قورس و، كۆت و زنجیرێ لەسەریان شەتەكدرابوو لایدەبا، مەبەست لابردنی ئەوشتانەیە كە لەسەر شانیان قورس و گران بوون: وەك خۆكوشتن بۆپەشیمان بوونەوە لەپەرستنی گۆیلكەكەو، حەرامییەتی دەستكەوتی جەنگیی..هتد، واتە: بەهاتنی ئەو پەیامبەرە ﷺ ئەو شتە قورسانە گشت هەڵگیران، وەكو خۆی ئەفەرموێ: ((بعثت بالحنيفية السمحة..)) واتە: بەشەریعەتێكی چاك وپاك وپڕ سەماحەتەوە كرامە پێغەمبەر، وە هەروا بەدوونوێنەرەكەی خۆی بۆ (یەمەن) – موعازو ئەبوموسا– ی وت: ((بشروا ولا تنفروا ويسروا ولا تعسروا وتطاوعا ولا تختلفا..)) بوخاریی و موسلیم. واتە: كە دەچن مژدەو مزگێنی دەر بن و، خەڵكی تارمەنێن و، ئاسانكاربن و، قسەی یەكتر ببیسن و، هەراوكێشە مەنێنەوە ﴿فالذين آمنوا به﴾ ئینجا ئەوانەی بڕوایان بەو پەیامبەرە هێنا ﴿وعزروه ونصروه﴾ و بەڕێزو حورمەتەوە رایانگرت و، هاوكاریی و پشتگیری لێكرد بەجیهادو تێكۆشان ﴿واتبعوا النور الذی انزل معه﴾ ودوای ئەو رووناكیەش كەوتن لەگەڵیا نێردراوە ﴿اولئك هم المفلحون﴾ ئەو خەڵكانە ئەمانە سیفەتیانبن، بەختیارو سەرفرازن .

## پەیامەكەی پێغەمبەر گشتگیرە:

﴿[١٥٨] قل يا ايها الناس﴾ ئەی پێغەمبەر!ﷺ بڵێ: ئەی خەڵكینە! ﴿إنی رسول الله إليكم جميعا﴾ چاك بزانن كە: من پەیامبەرو نێردراوی خوام بۆلای سەرجەم ئێوە ، نەك تەنها بۆلای هەندێكتان، وەك ئەم فەرموودە– پێشەوا ئەحمەد ١/٣٠١– پشتگیری ئەو راستیە دەكاو دەفەرموێ: ((أعطيت خمسا لم يعطهن نبی قبلی – ولا اقوله فخرا – بعثت إلى الناس كافة: الأحمر والأسود، ونصرت بالرعب مسيرة شهر، وأحلت لی الغنائم ولم تحل لأحد من قبلی، وجعلت لی الأرض مسجدا وطهورا، وأعطيت الشفاعة فأخرتها لأمتی يوم القيامة، فهی لمن لا يشرك بالله شيئا)) واتە: بە فەخریشەوە ناڵێم، پێنج شتم پێدراوە، هەتا ئێستا بەهیچ پێغەمبەرێكی بەرلە خۆم نەدراوە: من نێردراوم بۆ هەموو خەڵك، بۆ سوورو ڕەش..بۆ گشت ئادەمزاد، بەڵام پێغەمبەرانی تر هەریەكە بۆلای هۆزو گەلێكی تایبەتی رەوانە كران، وە بەترس خستنە ناو دڵی دوژمنەوە مەودای مانگە رێیەك یاریدرام ، وەدەستكەوتە جەنگیەكانم بۆ حەلاڵ كرا، كە بۆ گەلانی تر حەلاڵ نەبووە، وەهەموو زەوییم بۆكرایە نوێژگەو پاككەرەوە، وەشەفاعەتم پێبەخشراو، هێشتمەوە بۆ قیامەتی ئوممەتەكەم، بۆ ئەوانەیان (شەریك) بۆخوا بڕیار نادەن.﴿الذی له ملك السموات والأرض﴾ من ئەوخوایە ناردوومی كە دەسەڵاتدارێتی تەواوی ئاسمانەكان و زەویی تەنها هی ئەوە ﴿لا إله إلا هو﴾ ئەونەبێ ، هیچ پەرستراوێ بەهەق نییە ﴿يحيى ويميت﴾ ژیان ئەبەخشێ و، گیان دەستێنێ ﴿فآمنوا بالله ورسوله النبی الأمی﴾ دەسا ئێوەش بە خواو بەو پەیامبەرە هەواڵدەرە نەخوێندەوارەی خوا بڕوابكەن ﴿الذی يؤمن بالله وكلماته﴾ كە ئەوەی بۆ خۆی بڕوای كاملی بە خواو بە هەموو وشەكانی ئەو هەیە ﴿واتبعوه لعلكم تهتدون﴾ دەبێ ئێوەش شوێنی بكەون ، سا بەڵكو بەختیار و شارەزای ڕێگەی هەقبن ﴿[١٥٩] ومن قوم موسى﴾ وەلە گەلەكەی مووسادا وەك ئەوخەڵكە لاسارەی تێدایە، هەرلەو هۆزو گەلەشدا ﴿امة يهدون بالحق﴾ ئوممەت و دەستەیەكی وا هەیە ڕێگەی راست و دروست دەدەنە بەرو خەڵكیش بەهەق ڕێنما دەكەن ﴿وبه يعدلون﴾ و هەر بە هەقیش دادگەریی و حوكم ئەكەن ﴿[١٦٠] وقطعناهم اثنتی عشرة أسباطا امما﴾ وە لەبەر ئاسانكاری ئیش وكارەكان (بەنی ئیسرائیل)مان كردە دوازدە دەستە، بۆ ئەوەی هەر دەستەی سەرۆك و(نەقیب)ی خۆی بناسێ و، كاروباری خۆی بەرێتەوە لای ئەوو، سەری مووساش سووك ببێ ﴿واوحينا إلى موسى إذ استسقاه قومه﴾ ئەو كاتەش كە هۆزەكەی مووسا تینوویەتی

زۆری بۆ هێناو داوای ئاویان لێکرد، ئێمە سرووشمان بۆ کرد ﴿أن اضرب بعصاك الحجر﴾ کە بەدار دەستەکەت لەو بەردە بدە، ئەویش لێیدا ﴿فانبجست منه اثنتاعشرة عینا﴾ ودەست بەجێ دوازدە کانی لێهەڵقوڵیی" بە ژمارەی خۆیان" ﴿قد علم كل أناس مشربهم﴾ ئیتر هەموو دەستەیەکیان ئاوە خۆرەی خۆی دە زانی ﴿وظللنا علیهم الغمام﴾ وە لەودەشتە گەرمەی(کەنعان)ـەشدا هەورمان کردە سێبەر بۆیان ﴿وانزلنا علیهم المن والسلوی﴾ گەزۆو (شەلاقە)شمان ناردەسەریان و، بەئاسانی کەڵکیان لێوەر دەگرتن ﴿كلوا من طيبات ما رزقناكم﴾پێمان گوتن: سا لەو گشت شتە پاکانە پێمان بەخشیون بخۆن وسوپاسمان بکەن، کەچی ئەوان لەباتی ئەوە ناسوپاسییان کردین و وتیان: (..لن نصبر علی طعام واحد..) ٢/٦١.ئێمەش گوزەرانمان لێ تاڵکردن ﴿وماظلمونا﴾ وەنەبێ بەوکارەیان توانیبێتیان ستەمێ لەئێمە بکەن ﴿ولكن كانوا انفسهم يظلمون﴾ بەڵکو هەر لەخۆیان ستەمیان کرد، خۆیان خستە بەر قاری خوا، بەهۆی برووبیانوویەکی زۆریانەوە ﴿ ١٦١ وإذ قیل لهم اسكنوا هذه القرية﴾ ئەی پێغەمبەر! وەبیری ئەو جوولەکانە بێنە کەوتوونەتە سەردەمی تۆوە، ئەو دەمە بەپێشووەکانیان وترا – پاش گەرانەوەیان لە ماوەی سەرگەردانییەکەیان – بچنە ئەم شارەوە (بیت المقدس) ﴿وكلوا منها حيث شئتم﴾ لەهەر لایەکیش هەرچی ئارەزووتانە بیخۆن ﴿وقولوا حطة﴾ کە دەشچنە ناو شارەکەوە بڵێن: خوایا! گوناهەکانمان هەڵبوەرێ ﴿وادخلوا الباب سجدا﴾ وە لە دەرگاکەیەوە بەدەم سوژدەوە بچنە ژوورێ و سوپاسی خوا بکەن ﴿نغفر لكم خطیئاتكم﴾ ئەوسا ئێمەیش لە هەڵەو پەڵەکانتان دەبوورین ﴿وسنزيد المحسنين﴾هێمان بۆ ئەوانەی ئاکارچاکن، پاداشی زیاتریش دەدەین ﴿ ١٦٢ فبدل الذین ظلموا منهم قولا غير الذى قيل لهم﴾ ئینجا ئەو قسەی پێیان وترابوو کە: دەبێ لە کاتی چوونە ژوورەوەدا بڵێن: ((حطة)) خوایا! گوناهەکانمان



وَقَطَّعۡنَٰهُمُ ٱثۡنَتَيۡ عَشۡرَةَ أَسۡبَاطًا أُمَمٗاۚ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ
إِذِ ٱسۡتَسۡقَىٰهُ قَوۡمُهُۥٓ أَنِ ٱضۡرِب بِّعَصَاكَ ٱلۡحَجَرَۖ
فَٱنۢبَجَسَتۡ مِنۡهُ ٱثۡنَتَا عَشۡرَةَ عَيۡنٗاۖ قَدۡ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٖ
مَّشۡرَبَهُمۡۚ وَظَلَّلۡنَا عَلَيۡهِمُ ٱلۡغَمَٰمَ وَأَنزَلۡنَا عَلَيۡهِمُ ٱلۡمَنَّ
وَٱلسَّلۡوَىٰۖ كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقۡنَٰكُمۡۚ وَمَا
ظَلَمُونَا وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ١٦٠ وَإِذۡ
قِيلَ لَهُمُ ٱسۡكُنُواْ هَٰذِهِ ٱلۡقَرۡيَةَ وَكُلُواْ مِنۡهَا حَيۡثُ
شِئۡتُمۡ وَقُولُواْ حِطَّةٞ وَٱدۡخُلُواْ ٱلۡبَابَ سُجَّدٗا نَّغۡفِرۡ
لَكُمۡ خَطِيٓـَٰٔتِكُمۡۚ سَنَزِيدُ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ١٦١
فَبَدَّلَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنۡهُمۡ قَوۡلًا غَيۡرَ ٱلَّذِي قِيلَ لَهُمۡ
فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ رِجۡزٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ بِمَا كَانُواْ
يَظۡلِمُونَ ١٦٢ وَسۡـَٔلۡهُمۡ عَنِ ٱلۡقَرۡيَةِ ٱلَّتِي كَانَتۡ
حَاضِرَةَ ٱلۡبَحۡرِ إِذۡ يَعۡدُونَ فِي ٱلسَّبۡتِ إِذۡ تَأۡتِيهِمۡ
حِيتَانُهُمۡ يَوۡمَ سَبۡتِهِمۡ شُرَّعٗا وَيَوۡمَ لَا يَسۡبِتُونَ
لَا تَأۡتِيهِمۡۚ كَذَٰلِكَ نَبۡلُوهُم بِمَا كَانُواْ يَفۡسُقُونَ ١٦٣



هەڵبوەرێ، کەچی ستەمکارەکانیان هەڵسان و گۆڕییان و وتیان: (حنطة فی شعیرة)! وە لەباتی ئەوە کە بەکڕنووشەوە بچنە نێو شارەوە، بە پشتاو پشتێ چوونە ژوورێ !! ﴿فأرسلنا علیهم رجزا من السماء بما كانوا يظلمون﴾ جا ئێمەیش بەهۆی ئەو ستەمەوە کردیان، لە ئاسمانەوە سزایەکمان ناردە سەریان. سەیرێکی سوورەتی(بەقەرە)، ئایەتی شەست بکە، لەوێ تەفسیری ئەم ئایەتانە روونترکراوە ﴿ ١٦٣ وسئلهم عن القرية التى كانت حاضرة البحر﴾ ئەی پێغەمبەر! ﷺ دەربارەی شارەکەی (ئەیلە)وە کە دەکەوێتە قەراخی – دەریای سووروو ، نێوان مەدیەن و کێوی طوور– لێیان بپرسە: چی بەسەر هات و، هۆی بەسەرهاتەکەی چیبوو؟!﴿إذ يعدون فى السبت﴾ کاتێ کە لەڕۆژی شەممەدا نافەرمانی خوایان دەکردو، ماسییەکانیان لەو رۆژە قەدەغە کراوەدا ڕاو دەکرد! ﴿إذ تأتيهم حيتانهم يوم سبتهم شرعا﴾ چونکە لە رۆژی شەممەدا ماسییەکان ، بەزۆری لەسەر ئاوەکە دەردەکەوتن و،

بەئاسانی "وەك تاقییكردنەوەیەك"بۆیان دەگیردران ﴿ویوم لایسبتون لا تأتیهم﴾ بەلاَم ئەو رۆژە كە شەممە نەدەبوو، دیار نەدەمان و" خۆیان دەر نەدەخست ، ئەوانیش لە شەممەدا پشوویان بۆدەگرت و بۆ رۆژی یەكشەممە ئەیانگرتن و بەمە سنووریان بەزان ویاخیببوون ﴿كذلك نبلوهم﴾ ئاوا تاقییان ئەكەینەوە- لە تۆڵەی سەرپێچی خۆیاندا- ﴿بما كانوا یفسقون﴾ بە هۆی ئەوەی نافەرمانیان كردو لە سنوور دەرچوون . (أصحاب السبت) لەرۆژەكانی هەینیدا دەهاتن حەوزێكیان دروست دەكردو ماسیەكانیان تێدەكردو تێیدا دەمانەوە، ئەوسا تا شەممە بوایە دەستیان بۆ نە ئەبردن، بەڵكو -وەك فێڵێك- دەچوون رۆژی یەكشەممە دەریان دەهێنان !!.

**هەندێ لەجوولەكە سەرپێچی دەكەن و دەبنە مە یموون:**

الجزء التاسع　　　سورة الأعراف

وَإِذْ قَالَتْ أُمَّةٌ مِّنْهُمْ لِمَ تَعِظُونَ قَوْمًا ٱللَّهُ مُهْلِكُهُمْ أَوْ مُعَذِّبُهُمْ
عَذَابًا شَدِيدًا قَالُوا۟ مَعْذِرَةً إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿١٦٤﴾
فَلَمَّا نَسُوا۟ مَا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦٓ أَنجَيْنَا ٱلَّذِينَ يَنْهَوْنَ عَنِ ٱلسُّوٓءِ
وَأَخَذْنَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ بِعَذَابٍۭ بَـِٔيسٍۭ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ
﴿١٦٥﴾ فَلَمَّا عَتَوْا۟ عَن مَّا نُهُوا۟ عَنْهُ قُلْنَا لَهُمْ كُونُوا۟ قِرَدَةً خَٰسِـِٔينَ
﴿١٦٦﴾ وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكَ لَيَبْعَثَنَّ عَلَيْهِمْ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ مَن
يَسُومُهُمْ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ إِنَّ رَبَّكَ لَسَرِيعُ ٱلْعِقَابِ وَإِنَّهُۥ
لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٦٧﴾ وَقَطَّعْنَٰهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ أُمَمًا مِّنْهُمُ
ٱلصَّٰلِحُونَ وَمِنْهُمْ دُونَ ذَٰلِكَ وَبَلَوْنَٰهُم بِٱلْحَسَنَٰتِ
وَٱلسَّيِّـَٔاتِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿١٦٨﴾ فَخَلَفَ مِنۢ بَعْدِهِمْ خَلْفٌ
وَرِثُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ يَأْخُذُونَ عَرَضَ هَٰذَا ٱلْأَدْنَىٰ وَيَقُولُونَ سَيُغْفَرُ لَنَا
وَإِن يَأْتِهِمْ عَرَضٌ مِّثْلُهُۥ يَأْخُذُوهُ أَلَمْ يُؤْخَذْ عَلَيْهِم مِّيثَٰقُ ٱلْكِتَٰبِ
أَن لَّا يَقُولُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْحَقَّ وَدَرَسُوا۟ مَا فِيهِ وَٱلدَّارُ ٱلْءَاخِرَةُ
خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٦٩﴾ وَٱلَّذِينَ يُمَسِّكُونَ
بِٱلْكِتَٰبِ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُصْلِحِينَ ﴿١٧٠﴾

١٧٢　　　وَإِذْ نَتَقْنَا

﴿[١٦٤] وإذ قالت أمة منهم﴾ وەبیربێنن كە دەستەیەك لە خراپەكارەكانیان بەپیاو چاكەكانیان" كاتێ ئامۆژگارییان دەكردن" دەگوت: ﴿لم تعظون قوما﴾ بۆچی ئێوە ئامۆژگاریی كەسانێكی وا ئەكەن؟ ﴿الله مهلكهم﴾ كە خوا دەیەوێ لەناویان بەرێ ﴿او معذبهم عذابا شدیدا﴾ یان بەتوندی سزایان بدا؟! ﴿قالوا معذرة إلى ربكم﴾ وتیان: لەبەر پۆزشی لای پەروەردگارتان، بەڵكو بەوئامۆژگارییە توانیبێتمان ئەركی سەرشانی خۆمان جێبەجێ بكەین. ﴿ولعلهم یتقون﴾ شایەد ئەوانیش خۆبپارێزن لە نافەرمانی خوا ﴿[١٦٥] فلما نسوا ماذكروا به﴾ جا كە ئەو پەند و ئامۆژگارییەیان لە بیرخۆبردەوە و هیچ سوودێكی پێ نە گەیاندن ﴿انجینا الذین ینهون عن السوء﴾ ئێمەیش ئەوانەیانمان رزگاركرد كە رێیان لەخراپە دەگرت ﴿واخذنا الذین ظلموا بعذاب بئیس بما كانوا یفسقون﴾ زۆر بەتوندی سزای ئەوانەشماندا ستەمیان لە خۆ كردو، سنوورەكانیان بەزاند ﴿[١٦٦] فلما عتوا عن ما نهوا عنه﴾ جاكە بێباكانە درێژەیان بەوكارەیاندا رێگیری كرابوون لێی ﴿قلنا لهم﴾ پێمان وتن: ﴿كونوا قردة خاسئین﴾ دەسا لەتۆڵەی ئەوەدا ببنە (مەیموون) بە دوورەوە خراویی و سوك و ریسوا ، واتە: وەك مەیموون سوك و بێ رێز و بێ حورمەت بن، بەكورتیی وەكو تەفسیركارانی قورئان دەڵێن : دانیشتوانی گوندەكە بەهۆی تاوانەكانیانەوە بوونە سێ دەستە: دەستەیەكیان سەرپێچییان كردو سزای توند دران . دەستەیەكی تریان دەستیان لە خراپە هەڵگرت و رزگار بوون. دەستەیەكی تریان لەئاست گشت ناهەقیەك بێ دەنگ بوون، خوای گەورەخۆی چاك ئەزانێ ئەمانەیان چیان بەسەر هات ؟. جەماوەری زانایان لەسەر ئەوەن كە : سەرۆكەكانیان بوونە مەیموون و بەراز، بەلاَم دوای سێ رۆژ ، تیاچوون و مردن، وەك لە جێگای تردا خوا ئەفەموێ: (وجعل منهم القردة والخنازیر..) ﴿[١٦٧] وإذ تأذن ربك﴾ ئەمەش وەبیر بێنە كە پەروەردگارت پێشوەكانیانی تێگەیاند ﴿لیبعثن علیهم إلى یوم القیامة من یسومهم سوء العذاب﴾ كە تا رۆژی قیامەت كەسانێكی وا زاڵ دەكەم بەسەریاندا

کەهەمیشە خراپ ترین سزایان پێ بچێژێ ، ئەگەر باوەڕبە پێغەمبەر نەهێنن. بەڵێ.. وابوو، سەردەمێك بە(بختنصر)، ماوەیەك بەگاورەکان، ئەوجا بە (هیتلەر) ، سەرەڕای ئەوانەیش موسڵمانەکان هەموو کاتێ دەرس و پەندی قارەمانیەتیان دادەدان . خوا یاربێت بەم زووانەش چاوەڕوانی کۆتاجەنگیان لەگەڵ موسڵمانەکاندا دەکرێ، هەروەکو پەیامبەر ﷺ لەو بارەیەوە دەفەرموێ: (لا تقوم الساعة حتى يقاتل المسلمون اليهود..).﴿إن ربك لسريع العقاب﴾ بێگومانە کە پەروەردگارت زۆر زوو بەتۆڵەدا دەگا ﴿وإنه لغفور رحيم﴾ و زۆریش پۆشەرو لێبوردەو، دلۆڤان و میهرەبانە.

**جوولەکە بەم لاو بەولادا تەرە دەبن:**

﴿[١٦٨] وقطعناهم في الأرض أمما﴾ یەهوودمان لە زەوییدا پەرت کردن و بوونە چەند دەستەو بەستەی لێکترازاو و هەر دەستەیان کەوتە جێیەکەوە ﴿منهم الصالحون﴾ هە یانبوو پیاوچاك وصالح دەرچوو ﴿ومنهم دون ذلك﴾ و هەیشییانبوو چاك دەرنەچوو ﴿وبلوناهم بالحسنات والسيئات﴾ بە خۆشیی و ناخۆشیی تاقییمانکردنەوە ﴿لعلهم يرجعون﴾ تا بەڵکو بگەڕێنەوە بۆلای خوای خۆیان و واز لە کوفر بێنن ﴿[١٦٩] فخلف من بعدهم خلف﴾ کەچی لەپاشیانەوە جێنشینێکی بێ خێرو ناصالح و بەدکار بەجێماو هاتە جێگایان، وەك لەجێگایەکی تردا دەفەرموێ : ﴿ورثوا الكتاب﴾ و کتێبی تەوراتیان گرتەدەست، ﴿يأخذون عرض هذا الأدنى﴾ کە هەر بۆماڵ و کاڵای ئەم دنیا پەستە تێدەکۆشان لەباتی ئەو رۆژەکەی تر ﴿ويقولون سيغفر لنا﴾ ئەمە کاریانەودەشڵێن: بێ سۆ ئێمە هەرزوو لە لایەن خواوە تاوانەکانمان دەبەخشرێن ﴿وإن يأتهم عرض مثله﴾ خۆ ئەگەر دیسان کاڵایەکی وەك ئەوەیان دەست کەوتبا ، ئەگەر حەرامیش بووبا ﴿يأخذوه﴾ ئەوەند سروشت نزمن وەری دەگرن، واتە: بەردەوام خەریکی دونیان و، شوێنی ئاواتی پڕو پووچ دەکەون و، هەرگیز لە خراپە ناگەڕێنەوە ﴿ألم يؤخذ عليهم ميثاق الكتاب﴾ ئاخۆ لەو تەوراتەدا پەیمانی پتەویان لێ وەرنەگیراوە؟! ﴿أن لا يقولوا على الله إلا الحق﴾ کەبەرامبەر بەخودی خوا هەق نەبێ چیتر نەڵێن ﴿ودرسوا ما فيه﴾ ئەوی لە تەوراتەیشدا بوو هەموویان توێژی بوویەوەو دیراسەیان کردبوو، کەچی هەر گوێیان نەدا! ﴿والدار الآخرة خير للذين يتقون﴾ خۆ ئەو ماڵەکەی تر" رۆژی قیامەت" بۆ ئەو کەسانەی کە لەخوا دەترسن، باشترە لە لادان و ئەم دونیایەیان ﴿أفلا تعقلون﴾ دەسا تێناگەن و ژیرنابن ؟ ﴿[١٧٠] والذين يمسكون بالكتاب وأقاموا الصلاة﴾ ئەو کەسانەش کە هەمیشە دەست بە کتێبەکەی (تەورات)ـەوە دەگرن و، بەباشیش نوێژ دەکەن، دیارە بەوکارەیان دەبنە پیاوی چاك وصالح ﴿إنا لا نضيع أجر المصلحين﴾ بێگومان هەرگیز ئێمەش پاداشی چاکسازان زایە ناکەین. دیارە تا ئێرە لاساریی جوولەکەکانی باسکرد، ئێستایش دێتە سەرباسی قار لێگرتنیان، وەك ئەفەرموێ: ﴿[١٧١] وإذ نتقنا الجبل فوقهم﴾ ئەرێ لە بیرتانە ئەوکاتە کێوەکەی (توور)مان لەبن هێناو بەلای سەریانەوە راگرت ﴿كأنه ظلة﴾ دەتگوت پارچە هەورێکە بە حەواوە ﴿وظنوا أنه واقع بهم﴾ و وایان دەزانی ئەگەر فەرمانی خوا جێبەجێ نەکەن، بەسەریاندا دەکەوێ ﴿خذوا ما آتيناكم بقوة﴾ پێمان وتن : ئەوفەرمان و بڕیارانەی پێماندراون ، توند بیانگرن و کاریان پێ بکەن ﴿واذكروا ما فيه لعلكم تتقون﴾ وە هەرچیشی تێدایە هەر لەیادتان بێ و، رەفتاری پێ بکەن، بەشکو خۆ بپارێزن لە نافەرمانی خوا .

**خوا پەیمان لەزاڕۆو زیچی ئادەم دەگرێ ، کە بیپەرستن:**

﴿[١٧٢] وإذ أخذ ربك من بني آدم من ظهورهم ذريتهم﴾ ئەوکاتە وەبیر بێنە کە پەروەردگارت لەپشتی نەوەکانی ئادەم وەچەو نەوەی وەدەرهێنا ﴿وأشهدهم على أنفسهم﴾ و پەیمانی لێ وەرگرتن و، کردنی بەشایەد لەسەر خۆیان

بۆ یەکخواپەرستیتی ، ئەوجا فەرمووی: ﴿ألست بربكم﴾ ئەرێ من پەروەردگاری ئێوە نیم؟ ﴿قالوا بلى شهدنا﴾ گشت وتیان بەڵێ" ئێمە شایەتی دەدەین تۆ خوای ئێمەیت. هەندێ لە راڤەکەرانی قورئان دەڵێن: ئەم وتووێژو قسەوباسە واقیعییەو حەقیقەتی هەیە، بەڵگەشیان ئەو ریوایەتەیە کە (ئیبن عەبباس) ئەیهێنێ و ئەڵێ: هەرچی زاڕۆو نەوەی عەولادی ئادەم هەبوو کەخوا حەزبکا دروستیان بکات تاڕۆژی قیامەت، بەجارێ هەموویانی لەپشتی ئادەم هێنایە دەرێ و، پەیمانی لێ وەرگرتن کە: دەبێ هەر ئەوبپەرستن و، شەریك و هاوبەشی بۆدانەنێن، جاخواش کەفیل و دەستەبەری ڕۆژی ئەوان ئەبێ (رواه أحمد والنسائي والحاكم). بەڵام (ئیبن کەسیر) پێی وایە: کە ئەو بەڵێن و پەیمانە شتێکی فیعلیی نییە، بەڵکو تەنزیلەو تەمسیلە، مەبەستیش بەو شاهێدی دانە ئەوەیە کە: خوای گەورە گشت عەولادی ئادەمی بە(فیترەت) لەسەر یەکتاپەرستیی دروستکردووە، وەك (شێخ حەسەنی بەصری)یش دەڵێ، بەڵگەیش ئەوەیە کەخوا لەئایەتەکەدا دەفەرموێ: (من بني آدم) و نافەرموێ: (من آدم)، وە دەفەرموێ: (من ظهورهم) نەیفەرموو: (من ظهره). (ئیبن کەسیر) ئەڵێت ریوایەتەکەی (ئیبن عەبباس)یش (مەوقوف)ە، نەك (مرفوع). ﴿ان تقولوا يوم القيامة﴾ نەکا ڕۆژی قیامەت بڵێن: ﴿إنا كنا عن هذا غافلين﴾ بەراستیی ئێمە لەم یەکتاپەرستییە بێ ئاگاو خافڵ بووین، ﴿[١٧٣] او تقولوا إنما اشرك آباؤنا من قبل﴾ یانەڵێن: باوو باپیرانمان– لەپێش ئێمەوە – هاوەڵیان بۆخوا دانا، ئەوسا ئێمەش چاومان لێکردن، ئەگینا وا نە ئەبووین ﴿وكنا ذرية من بعدهم﴾ خۆ ئێمە کۆمەڵێ زاڕۆو مناڵی دوای ئەوان بووین و، چاومان لەوان کردو، ئاگامان لەهیچ شتێ نەبوو ﴿افتهلكنا بما فعل المبطلون﴾ ئاخۆ "خوایا!" دەتەوێ ئێستا بەهۆی کاروکرداری ناهەق بێژان و بەتاڵکارانەوە لەناومان ببەیت؟! ﴿[١٧٤] وكذلك نفصل الآيات﴾ هەرئاوا ئایەت و بەڵگەکانی خۆمان ڕۆشن ئەکەینەوە، تا مەردوم تێفکرێن وهەق وناهەق لێك بکەنەوە ﴿ولعلهم يرجعون﴾ وبەشکو لە سەرلێشواویی بگەڕێنەوە..

الجزء التاسع سورة الأعراف

الحزب ١٨

وَإِذْ نَتَقْنَا ٱلْجَبَلَ فَوْقَهُمْ كَأَنَّهُۥ ظُلَّةٌ وَظَنُّوٓا۟ أَنَّهُۥ وَاقِعٌۢ بِهِمْ
خُذُوا۟ مَآ ءَاتَيْنَٰكُم بِقُوَّةٍ وَٱذْكُرُوا۟ مَا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٧١﴾
وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِىٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ
عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ ۖ قَالُوا۟ بَلَىٰ ۛ شَهِدْنَآ ۛ أَن تَقُولُوا۟ يَوْمَ
ٱلْقِيَٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَٰذَا غَٰفِلِينَ ﴿١٧٢﴾ أَوْ تَقُولُوٓا۟ إِنَّمَآ أَشْرَكَ
ءَابَآؤُنَا مِن قَبْلُ وَكُنَّا ذُرِّيَّةً مِّنۢ بَعْدِهِمْ ۖ أَفَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ
ٱلْمُبْطِلُونَ ﴿١٧٣﴾ وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ وَلَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ
﴿١٧٤﴾ وَٱتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ ٱلَّذِىٓ ءَاتَيْنَٰهُ ءَايَٰتِنَا فَٱنسَلَخَ مِنْهَا
فَأَتْبَعَهُ ٱلشَّيْطَٰنُ فَكَانَ مِنَ ٱلْغَاوِينَ ﴿١٧٥﴾ وَلَوْ شِئْنَا
لَرَفَعْنَٰهُ بِهَا وَلَٰكِنَّهُۥٓ أَخْلَدَ إِلَى ٱلْأَرْضِ وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ ۚ فَمَثَلُهُۥ
كَمَثَلِ ٱلْكَلْبِ إِن تَحْمِلْ عَلَيْهِ يَلْهَثْ أَوْ تَتْرُكْهُ
يَلْهَث ۚ ذَّٰلِكَ مَثَلُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا ۚ فَٱقْصُصِ
ٱلْقَصَصَ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١٧٦﴾ سَآءَ مَثَلًا ٱلْقَوْمُ ٱلَّذِينَ
كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا وَأَنفُسَهُمْ كَانُوا۟ يَظْلِمُونَ ﴿١٧٧﴾ مَن يَهْدِ ٱللَّهُ
فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِى ۖ وَمَن يُضْلِلْ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿١٧٨﴾

١٧٣

**نموونەی زانای لارو لاسار:**

ئینجا خوای گەورە نموونەی زانا خراپەکانی سەردەم دێنێتەوەو ئەفەرموێ: ﴿[١٧٥] واتل عليهم نبأ الذى آتيناه آياتنا﴾ ئەی پێغەمبەر! ﷺ دەنگ و باسی ئەوکەسە سەر لێشواوەیان بۆ بخوێنە کە بەڵگەو نیشانەی خۆمانمان پێدا. (عەبدوڵڵای کوری مەسعود) ئەڵێ: ئەوزانایە (بەلعەمی کوری باعورا)یە، کاتی خۆی موسا ناردی بۆ ئامۆژگاری پاشای (مەدیەن) و، پاشاکەش ڕێزێکی زۆری لێگرت و، لە ئەنجامی ئەو ڕێز لێگرتنەوەوە چووە سەر ئایینی ئەوان و، نەگەڕایەوە لای موسا !هەندێ ڕیوایەتیش لە ئیبنی مەسعوودو، غەیری ئەویشەوە ئەڵێن: ئەو پیاوە پیاوێکی صالح بووە، پێش ئەوە بەنی ئیسرائیلیەکان بچنە فەلەستین ئەو لەوێ بووە، بەڵام چوونکە لەوە

دڵنیانین کەجوولەکە دەسکاری ئەو ڕیوایەتەیان نەکردبێ، ناتوانین متمانە بخەینە سەری. لەولایشەو ڕیوایەتەکان جیاوازیی و، پشێویی و، ئاڵۆزیەکی زۆریان تێدایە، بۆ نموونە ڕیوایەتێ دەڵێت: ئەو پیاوە ناوی (بلعام کوڕی باعورا)یەو لەبەنی ئیسرائیلییەکان بووە، یەکێ دیکە ئەڵێت: لە دەسەڵاتدارەکانی فەلەستینە، یەکێکی تر دەڵێت: پیاوێکی عەرەبە، ناوی (ئومەییەی کوڕی سەڵت) بووە، هەندێ تر دەڵێن هاوچەرخی پەیامبەر بووەو، پێیان وتووە (أبو عامر الفاسق). هەندێ تر دەڵێن: نەخێر، هاوچەرخی مووسا بووە. هەندێکیتر دەڵێن: نەخێر پاش مووسا بووە..جا لەبەر ئەو ئاڵۆزیە، دیاری نەکردن و دان نەنان بە هیچ کامێکیاندا چاکترو گونجاوترە لەگەڵ دەق و ڕۆحی قورئانەکەدا، چونکە نە لە قورئاندا، وە نە لەفەرموودەیەکی "مرفوع"دا دیاری کراوە. بەڵام گرنگ ئەمەیە کە بزانرێ: ئەوانەی وا بڕوا ناهێنن و ملکەچ نابن بۆ ئایەتەکانی خوا پاش ئەوەی بۆیان ڕوون کراوەیە، هەر لە دوودڵی و ئەمبەرو ئەو بەردا ئەبن، حاڵیان وەك حاڵی سەگێکی ماندوو وایەو، هەرگیز سروشتی خۆی تێك نەداو، هەر هاسکە هاسکی خۆی بکا، ئەو جۆرە زانا سەر لێشێواوانەش ئایەتەکانیان چ بۆ بخوێنرێتەوە، یان نەء؟..لە ئەمبەرو ئەو بەری خۆیان ناکەون و هەر ڕۆژەی لە سەنگەرێکدان و، لە دەرگایەك دەدەن!!. ﴿فانسلخ منها﴾ خۆی لێداڕنین و یەخەی لێ هەڵتەکاندن" واتە: خۆی کافر کردو نەگەڕایەوە بۆ هەق" ﴿فأتبعه الشیطان﴾ ئینجا شەیتان دوای هەنگاوەکانی خۆی خست ﴿فكان من الغاوین﴾ جاچووە ناو ڕیزی گومڕایانەوە ﴿[١٧٦] ولو شئنا لرفعناه بها﴾ ئەگەر ویستبامان پلەی بەرزیمان بەو ئایەتانە دەدایەو، دوای ناهەقیی نەدەکەوت ﴿ولكنه اخلد إلى الأرض﴾ بەڵام ئەو خۆی بەزەوییدا نووساند, واتە: دونیای هەڵبژاردو ڕووی تێکرد ﴿واتبع هواه﴾ وپەیڕەوی لە هەواو ئارەزووی خۆی کرد، دەرەنجام سەرگەردان بوو ﴿فمثله كمثل الكلب﴾ نەزیلەو نموونەی ئەو جۆرەکەسانە–لە پەستییدا–وەك نەزیلەی ئەو سەگە هارە وایە ﴿إن تحمل علیه یلهث﴾ ئەگەر تاری بنێیت و بۆی بچیت ، ئەولە ماندوویی خۆیدا زمانت لێ دەردەکێشێ ﴿وإن تتركه یلهث﴾ و ئەگەر وازیشی لێ بهێنی، هەر زمان دەردێنێ و، خەریکی هاسکە هاسکی خۆی دەبێ."واتە: هەر زۆرت بۆ هێنا هەڵدێ و هاسکە هاسکی پێ دەکەوێ، وازیشت لێ هێنا هەروایەو دێتە سەرت! ئەو کەسەیش کە خۆی بوارد لە ئایەتەکانی خوا، بزانێ یان نەزانێ، سروشتی تێکچووەو قەت ناگۆڕێ و، هەر سووکەو هەر ڕۆژەی لەلایەکە ﴿ذلك مثل القوم الذین كذبوا بآیاتنا﴾ ئەو بەسەرهات و چیرۆکەیە نموونەی بەسەر هاتی ئەو کەسانەیە کە: ئایەتەکانی ئێمەیان بەدرۆدانا و کاریان پێ نەکردن"جا جوولەکە بن، یان نا ﴿فاقصص القصص﴾ جا تۆیش ئەم داستانەیان بۆ بگێڕەوە ﴿لعلهم یتفكرون﴾ بەڵکو بیر بکەنەوەو ئامۆژگاری وەرگرن و، لەڕێی ڕاست کلا نەبن ﴿[١٧٧] ساء مثلا القوم الذین كذبوا بآیاتنا﴾ چەند خراپە نەزیلەو سەرگوزەشتەی ئەو کۆمەڵەی کە ئایەتەکانی ئێمەیان بە درۆدانا ﴿وانفسهم كانوا یظلمون﴾ ستەمیشیان هەر لە خۆیان کرد، نەك لە ئێمە، خۆیان زیانمەند بوون و ڕێگای هەقیان بزر کرد ﴿[١٧٨] من یهد الله فهو المهتدی﴾ هەر کەسێك خوا ڕێنمایی بکات– بۆ لای هەق– دیارە هەر ئەوە بەختیارو سەرفرازو شارەزای ڕاستییە ﴿ومن یضلل فأولئك هم الخاسرون﴾ وهەر کەسیش –بەهۆی لاساریی خۆیەوە–گومڕای بکا، لە ڕیزی زەرەر مەنداندایە .

**هەرلە(ئەزەل)دا خەڵكانی جەهەننەمی دیاری کراون:**

﴿[١٧٩] ولقد ذرانا لجهنم كثیرا من الجن والإنس﴾ بێ سو زۆرێکمان لە جنۆکەو لە ئادەمیی بۆ دۆزەخ بەدی هێنا، چونکە لە ئەنجامدا بە ئارەزووی خۆیان ڕێگای بەدبەختیی دەگرنە بەر ، واتە: بەرلەوە دروستیان بکەین دەمانزانی کێ چاکە دەکاو، کێش خراپکارە، بۆیە ئێمەش بڕیاری واماندا ﴿لهم قلوب لا یفقهون بها﴾ دڵیان هەیە، کەچی هەقی

پیٚ وەرناگرن و تیٚ ناگەن لەهەق ﴿ولهم اعين لا يبصرون بها﴾ و چاویان هەیە، کەچی دەسەڵاتی خوای پێنابینن ﴿ولهم آذان لا يسمعون بها﴾ وهەستی بیستنیان هەیە، بەڵام پێینابیسن. واتە: دڵ و چاوو گویٚ و..هتد ئامێری وەرگرتن و ورد بوونەوەن و، بە هەق گەیشتنن، بەڵام بەداخەوە ئەوانە نە بیر ئەکەنەوە ، نە وردیش ئەبنەوە، نە راستیش ئەبیسن ﴿اولئك كالأنعام﴾ ئەمانە وەك ئاژەڵ ومەڕو بزن و وشترو گان ﴿بل هم اضل﴾ بەڵکو ئەوان لە ئاژەڵیش ویڵترن، چونکە ئاژەڵ دەگەڕیٚ لە شوێن سوودو کەڵکی خۆی ، وەلە زیان وزەرەری خۆی ڕادەکات ﴿أولئك هم الغافلون﴾ ئەوانەن خافڵ وبیٚ ئاگا لە ئایەتەکانمان.

**ناوە پیرۆزو جوانەکان هەر هی خوان:**



وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ لَهُمْ قُلُوبٌ
لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ آذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ
بِهَا أُولَٰئِكَ كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ أُولَٰئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ ﴿١٧٩﴾
وَلِلَّهِ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَىٰ فَادْعُوهُ بِهَا وَذَرُوا الَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِي
أَسْمَائِهِ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١٨٠﴾ وَمِمَّنْ خَلَقْنَا أُمَّةٌ
يَهْدُونَ بِالْحَقِّ وَبِهِ يَعْدِلُونَ ﴿١٨١﴾ وَالَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا
سَنَسْتَدْرِجُهُم مِّنْ حَيْثُ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨٢﴾ وَأُمْلِي لَهُمْ إِنَّ
كَيْدِي مَتِينٌ ﴿١٨٣﴾ أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا مَا بِصَاحِبِهِم مِّن جِنَّةٍ إِنْ
هُوَ إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿١٨٤﴾ أَوَلَمْ يَنظُرُوا فِي مَلَكُوتِ السَّمَاوَاتِ
وَالْأَرْضِ وَمَا خَلَقَ اللَّهُ مِن شَيْءٍ وَأَنْ عَسَىٰ أَن يَكُونَ قَدِ اقْتَرَبَ
أَجَلُهُمْ فَبِأَيِّ حَدِيثٍ بَعْدَهُ يُؤْمِنُونَ ﴿١٨٥﴾ مَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَلَا
هَادِيَ لَهُ وَيَذَرُهُمْ فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١٨٦﴾ يَسْأَلُونَكَ عَنِ السَّاعَةِ
أَيَّانَ مُرْسَاهَا قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ رَبِّي لَا يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَا إِلَّا هُوَ ثَقُلَتْ
فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ لَا تَأْتِيكُمْ إِلَّا بَغْتَةً يَسْأَلُونَكَ كَأَنَّكَ حَفِيٌّ
عَنْهَا قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ اللَّهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨٧﴾



﴿[١٨٠] ولله الأسماء الحسنى﴾ ناوەکانی خوا هەموو جوان و پڕشکۆن ﴿فادعوه بها﴾ دەسا ئێوەیش هەر بەو ناوانەوە بانگی بکەن، لاڵەو نزاو داواهەر بەوانە بکەن. (بوخار وموسلیم وترمزی وئیبن ماجە) ریوایەت دەکەن کە: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((إن لله تسعة وتسعين إسما مائة إلا واحدا، من أحصاها دخل الجنة، و هو وتر يحب الوتر)). وەترمزی بە تەنیا خۆی ئەمە لە پێغەمبەرەوە - زیاد لەریوایەتی یەکەم - دەگێڕێتەوەو ناوە جوانەکان ئەژمار دەکات: (وهو الله الذى لاإله إلا هوالرحمن الرحيم، الملك، القدوس، السلام، المؤمن، المهيمن، العزيز، الجبار، المتكبر، الخالق، البارىء، المصور، الغفار، القهار، الوهاب، الرزاق، الفتاح، العليم ، القابض، الباسط، الخافض، الرافع، المعز، المذل، السميع، البصير، الحكم، العدل، اللطيف، الخبير، الحليم، العظيم، الغفور، الشكور ، العلى، الكبير، الحفيظ، المقيت، الحسيب، الجليل، الكريم، الرقيب، المجيب، الواسع، الحكيم، الودود، المجيد، الباعث، الشهيد ، الحق، الوكيل، القوى، المتين، الولى، الحميد، المحصى، المبدیء، المعيد، المحى، المميت، الحى، القيوم، الواجد، الماجد، الواحد ، الصمد، القادر، المقتدر، المقدم، المؤخر، الأول، الآخر، الظاهر، الباطن، الوالى، المتعالى، البر، التواب، المنتقم، العفو، الرءوف ، مالك الملك، ذوالجلال و الإكرام، المقسط، الجامع، الغنى، المغنى، المانع، الضار، النافع، النور، الهادى، البديع، الباقى، الوارث، الرشيد، الصبور)).

بەڵێ ئەمە ئەو (٩٩) ناوە پیرۆزەیە کە لەقورئان و فەرموودەکاندا هاتوون و(ترمزیی)یش کۆیکردوونەتەوەو لەکتێبەکەی خۆیدا بەوشێوە نووسیونی، دەبیٚ ئەوەش بزانریٚ کەناوەپیرۆزەکان تەنها لەو (٩٩) ناوەدا نەبڕاونەتەوە، وەکو پێشەوا (ئەحمەد) لە جێی خۆیدا لەوبارەوە فەرموودەی هێناوە. ﴿وذروا الذين يلحدون فى اسمائه﴾ لەوانەگەڕێن دەس وەردەدەن لەناوەکانی خواو بەدەس ئەنقەست دەیانگۆڕن، واتە: لەماناو مەبەست لایان دەدەن، یان ناوی تری بۆ دادەنێن! بۆنموونە: موشریکەکان لە باتی ئەوە کەناوی (الله) بێنن، دەیانگوت (لات)، یان

لە باتى ئەوە بڵێن (عزيز) ئەيانوت: (عزى)..هتد. ﴿سيجزون ما كانوا يعملون﴾ دڵنيابە ئەوانە بە تۆڵەى كردەوەى خۆيان ئەگەن. هاوەڵانى پەيامبەر ﷺ جارى وابوو دەيانگوت " ياالله" جارى وايشبوو دەيانگووت " يارەحمان" (ئەبوجەهل)يش گوێى لەوە بوو وتى: موحەممەد لەلايەكەوە دەڵێت يەك خوا هەيە، كەچى لەپاڕانەوەدا هاوار و هانا بۆ چەند خوايەك ئەبا ؟! جا لەوەڵامى ئەوەدا ئەم ئايەتەى (ولله الأسماء الحسنى..) هاتە خوارێ. تەفسيرى (ئيبن كەسير). ﴿١٨١ وممن خلقنا امة يهدون بالحق﴾ لەومرۆڤانەدا دروستمانكردون، هەميشە ئوممەت و گەلى واهەيە كە: بە رەو رێگاى ڕاست و دروست خەڵكى هيدايەت ئەكەن ﴿وبه يعدلون﴾ و بەهەقيش بڕيار ئەدەن و داوەريى ئەكەن، ئەگەرچى دونيايش پڕبێ لە ستەم، واتە: لەناوئوممەتى هەمووپێغەمبەرێكدا پياو چاك و(داعيه) هەڵكەوتووە: وەكو لە فەرموودەيەكى (متفق عليه) داهاتووەو دەفەرموێ: (لا تزال طائفة من أمتى ظاهرين على الحق لا يضرهم من خذلهم ولا من خالفهم حتى تقوم الساعة).واتە: لەئوممەتى مندا هەتا قيامەت دێت پشتيوانانى هەق نابڕێن ، سەرپێچى ئەم و ئەويش زيانێكيان پێ ناگەيەنێت ﴿١٨٢ والذين كذبوا بآياتنا﴾ ئەوانەش بڕوايان بە ئايەت و نيشانەكانى ئێمە نيەو بەدرۆيان دانان ﴿سنستدرجهم من حيث لا يعلمون﴾ هێدى هێدى ئەيانگرين بێ ئەوە بەخۆشيان بزانن. (ئيستيدراج) ئەوەيە هەركە گوناحێ دەكەن، لەباتى ئەوە خواى گەورە تۆڵەيان لێ بسێنێ، گوزەرانيان باشتر دەكا، ئەوانيش چەواشە دەبن و زياتر سەر دەكەنە ناوتاوان و گوناح، ئيتر كتوپڕ خوا قاريان لێ دەگرێت ﴿١٨٣ واملى لهم﴾ وماوەيەكيش مۆڵەتيان ئەدەم و، سزايان دوا ئەخەم هەتاپتر مەستى دنيا دەبن ﴿إن كيدى متين﴾ دڵنيابن پلانم بۆ لەناو بردنيان زۆر ورد و بەهێزە ﴿١٨٤ اولم يتفكروا ما بصاحبهم من جنة﴾ ئاخۆ بيريان نەكردۆتەوە، تا بزانن كە هاوڕێكەيان "محمد ﷺ" هەرگيز تووشى شێتى نەبووە؟ ئەمە وەڵامى ئەو ئايەتەيە كە دەفەرموێ: (يأيها الذى نزل عليه الذكر إنك لمجنون). ﴿إن هو إلا نذير مبين﴾ ئەوهەرپەيامبەرێكى ترسێنەرى ئاشكرايە بۆ هەر خاوەن دڵێك ، ئيتر چۆن پێى ئەڵێن شێتە..؟! ﴿١٨٥ او لم ينظروا فى ملكوت السموات والأرض وما خلق الله من شئ﴾ ئايا بۆ زانينى دەسەڵاتى گەورەيى و فراوانيى خوا، لەئاسمانەكان و زەويى و لەو هەمووشتانەى ترە كە خوا دورستى كردوون ڕانەماون تاملكەچ بن ؟ ﴿وان عسى ان يكون قد اقترب اجلهم﴾ خۆ لەوەش دەچێ ئاكاميان نزيك بووبێتەوەو دەرفەتيان نەمێنێ بۆ بەدەستهێنانى كردەوەى چاك ؟! ﴿فبأى حديث بعده يؤمنون﴾ جا ئەگەر بەم قورئانە بڕوا نەكەن و دانەچڵەكێن، دەبێ بەچ قسەيەكى تر بڕوا بكەن ﴿١٨٦ ومن يضلل الله فلا هادى له﴾ خوا ڕێ لە هەركەسێك بگۆڕێ "بەهۆى لاساريى ئەوكەسە خۆيەوە" ئيتر هيچ ڕێبەرێكى بۆنييە دەستى بگرێ ﴿ويذرهم فى طغيانهم يعمهون﴾ سەرەڕاى ئەوەش وازيان لێدێنێ باهەر لەناو سەركەشى خۆياندا سەرگەردان بن.

**هاتنى رۆژى سەڵاو نيشانەكانى:**

هاوبەشدانەرەكان وتيان: ئەى پێغەمبەر! ﷺ ئەگەر ڕاست دەكەيت تۆ پەيامبەرى خوايت، دەسا پێمان بڵێ: ڕۆژى قيامەت كەيدێت؟ جا خوا ئەم ئايەتەى دابەزاندو فەرمووى: ﴿١٨٧ يسألونك عن الساعة﴾ لە بابەت ڕۆژى قيامەتەوە لێت دەپرسن:﴿أيان مرسيها﴾ كەى ڕوو دەداو دێتەدى ؟﴿قل إنما علمها عند ربى﴾ پێيان بڵێ: تەنها پەروەردگارم دەزانێ كەى دێت ﴿لا يجليها لوقتها إلا هو﴾ ئەو نەبێ هيچ كەسێك ناتوانێ لەكاتى خۆيدا بيخاتە ڕوو و ديارىى بكا ﴿ثقلت فى السموات والأرض﴾ هەڵهێنان و زانينى هاتنى كاتى قيامەت بۆگشت ئەوانەى لە ئاسمانەكان و زەوييدان قورس و سەختە ﴿لا تأتيكم إلا بغتة﴾ هەر كتوپڕێك بۆتان دێ. (تەبەريى) ئەم فەرموودەى پێغەمبەرە دێنێ: كە ڕۆژێ قيامەت دەرگا بە مەردم دەگرێ، خەڵكيش بێ ئاگايە لێى، يەكێ گۆڵاوەكەى چاك دەكا،

یەکێ ئاوی مەڕو پاتاڵەکەی دەدا، یەکێ لەبازاردا کاڵاکەی دەنوێنێ، تەرازووەکەی بەرزکردۆتەوە ، نرم کردۆتەوە.
یان لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە: هەتا خۆر لە خۆرئاواوە هەڵنەیەت، قیامەت نایەت، جاهەر کە هەڵهات
وخەڵکیش دیتیان، ئەوجا گشت باوەڕ دێنن، دیارە ئیتر ئەوکاتەیە لەهیچ کەسێك باوەڕ وەرناگیرێ ، ئەگەر بەر لەوە
باوەڕی نەهێنابێ. ﴿يسألونك كأنك حفي عنها﴾ جۆرێك لەتۆ ئەپرسن -ئەی موحەممەدﷺ!- وەك تۆ لە زانینی
هاتنەکەیدا پسپۆڕ بیت ﴿قل إنما علمها عندالله﴾ تۆیش بڵێ: تەنها هەر خوا خۆی دەیزانێ "هیچ کەسی تر نایزانێ"،
ئیتر ئەوانیش با ئەوەندە لەسەری نەڕۆن ﴿ولكن اكثر الناس لا يعلمون﴾ بەڵام زۆربەی ئەم مەردمە ڕاستییەکان
نازانن.

الجزء التاسع سورة الأعراف

قُل لَّآ أَمۡلِكُ لِنَفۡسِي نَفۡعٗا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۚ وَلَوۡ كُنتُ
أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ لَٱسۡتَكۡثَرۡتُ مِنَ ٱلۡخَيۡرِ وَمَا مَسَّنِيَ ٱلسُّوٓءُۚ إِنۡ
أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٞ وَبَشِيرٞ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ١٨٨ ۞ هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَكُم
مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَجَعَلَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا لِيَسۡكُنَ إِلَيۡهَاۖ فَلَمَّا
تَغَشَّىٰهَا حَمَلَتۡ حَمۡلًا خَفِيفٗا فَمَرَّتۡ بِهِۦۖ فَلَمَّآ أَثۡقَلَت دَّعَوَا
ٱللَّهَ رَبَّهُمَا لَئِنۡ ءَاتَيۡتَنَا صَٰلِحٗا لَّنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ١٨٩
فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُمَا صَٰلِحٗا جَعَلَا لَهُۥ شُرَكَآءَ فِيمَآ ءَاتَىٰهُمَاۚ فَتَعَٰلَى
ٱللَّهُ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ١٩٠ أَيُشۡرِكُونَ مَا لَا يَخۡلُقُ شَيۡـٔٗا وَهُمۡ يُخۡلَقُونَ
١٩١ وَلَا يَسۡتَطِيعُونَ لَهُمۡ نَصۡرٗا وَلَآ أَنفُسَهُمۡ يَنصُرُونَ ١٩٢
وَإِن تَدۡعُوهُمۡ إِلَى ٱلۡهُدَىٰ لَا يَتَّبِعُوكُمۡۚ سَوَآءٌ عَلَيۡكُمۡ أَدَعَوۡتُمُوهُمۡ
أَمۡ أَنتُمۡ صَٰمِتُونَ ١٩٣ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ
عِبَادٌ أَمۡثَالُكُمۡۖ فَٱدۡعُوهُمۡ فَلۡيَسۡتَجِيبُواْ لَكُمۡ إِن
كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ١٩٤ أَلَهُمۡ أَرۡجُلٞ يَمۡشُونَ بِهَآۖ أَمۡ لَهُمۡ أَيۡدٖ
يَبۡطِشُونَ بِهَآۖ أَمۡ لَهُمۡ أَعۡيُنٞ يُبۡصِرُونَ بِهَآۖ أَمۡ لَهُمۡ ءَاذَانٞ
يَسۡمَعُونَ بِهَاۗ قُلِ ٱدۡعُواْ شُرَكَآءَكُمۡ ثُمَّ كِيدُونِ فَلَا تُنظِرُونِ ١٩٥

الحزب ١٨

١٧٥

**پێغەمبەریش(موحەممەد ) بۆ خۆی شتێکی بەدەس نیە :**

﴿[188] قل لا أملك لنفسي نفعا ولا ضرا إلا ما شاءالله﴾
بڵێ: من خاوەنی هیچ شتێك- چ سوود، چ زیان- بۆ خۆشم
نیم، مەگەر ئەوەندە خوا مەیلی هەبێت، ئیتر من لە کوێ
هاتنی ڕۆژی قیامەت ئەزانم؟" ﴿ولوكنت أعلم الغيب﴾ ئەگەر
من غەیب و نادیارم زانیبا بی وەحیی ﴿لاستكثرت من
الخير﴾ ئەو حەلە خێرو بێری زۆرم بۆ خۆم گیر دەکەوت
﴿وما مسني السوء﴾ وقەتیش خراپەو زیانم تووش
نەدەبوو ﴿إن انا إلا نذير وبشير﴾ هەموو بزانن من تەنها
ترسێنەرو موژدە دەرم ﴿لقوم يؤمنون﴾ بۆ کەسانێ بڕوا
دەکەن بەپەیامبەریەتی من .

**هەموو لەیەك کەسن ( ئادەم ):**

﴿[189] هوالذي خلقكم من نفس واحدة﴾ هەر ئەو خوایەیە
کە ئێوەی لە تەنها کەسێك (ئادەم) دروستکرد ﴿وجعل منها
زوجها ليسكن إليها﴾ وهەرلە ویش (حەووا)ی هاوسەری-
بۆدڵ ئارامیی ئەو- فەراهەم هێنا ﴿فلما تغشاها﴾ جاکە
ئادەم لەگەڵیا جووت بووو ﴿حملت حملا خفيفا﴾ ئەویش
لەسەرخۆ دووگیان بوو ﴿فمرت به﴾ جا ماوەیەکیش بەوسکەوە مایەوە، واتە: تا کاتی لەدایکبوونی گوزەراندیی و
کاری ڕۆژانەیشی پێوە دەکرد ﴿فلما اثقلت﴾ جا کە چوویە قۆناخی سەختیی و قورسیەوە، واتە: لەدایکبوونی
نزیك بوویەوە ﴿دعوا الله ربهما﴾ هەردوو لە خوای پەروەردگاریان پاڕانەوەو وتیان: پەروەردگارمان: ﴿لئن آتيتنا
صالحا﴾ شەرتبێ ئەگەر منداڵێکی نێرینەی چاکمان پێ ببەخشیێ ﴿لنكونن من الشاكرين﴾ لە خەڵکانی شوکرانە
بژێربین ﴿[190] فلما آتاهما صالحا﴾ جاهەر کە منداڵێکی نێرینەی صالح و راساڵی دانێ ﴿جعلا له شركاء فيما
آتاهما﴾ ئەوی خوا پێیدابوون کردیانە شەریك و هاوبەش بۆیی و، پەیمانەکەی خۆیانیان شکاند ﴿فتعالى الله عما
يشركون﴾ جا خوا بەرزو بڵندە، پاك وبێخەوشە لەوە ئەوانە دەیکەنە هاوبەشی . بەڵێ.. ئەگەر سەیرێکی ئەم
ڕووداوو داستانەیە بکرێ، وادەردەکەوێ-لە چاوی ئێمەوە- زۆر ئاڵۆزە، چونکە ئەگەر بەوردی سەیری داڕشتنی

قورئانەکە بکریٚ دەبیٚ بابە (ئادەم)و دایە (حەوا) منداڵەکەیان کردبێتە هاوبەشی خوا!! ئیتر چۆن؟ لە بەر چی؟ ئێمە شتێکی بەهێزمان بە دەستەوەنییە بۆ چۆنیەتییەکەی، ئەگەرچی فەرموودەیەك هەیە پێشەوا (ئەحمەد)و(تیرمزیی)هێناویانە، ئەویش ئیمامی (ئیبنی کەسیر) لەبارەیەوە ئەڵێت: لەسیٚ ڕێگەوە ناتەواو(مەعلوول)ە، بێجگە لەوەش دەڵێت: ئەوفەرموودەیە (مەوقووف)ە. ئەگەر هەرشتێکی تر لەو بابەتەوە هەبیٚ بە لاوازی دادەنیٚ. وە هەروەها بەرێزی دەڵیت: ئیمام (حەسنی بەصریی) پێی وایەکە: مەبەست بەم ڕووداوە بابە (ئادەم) و دایە (حەوا) نییە، پاشان ئیبن کەسیر دەڵێت من بۆخۆم ئەم رایەم بە دڵە، بەڵگەیشم ئایەتی (فتعالی الله عما یشرکون)ە، منیش وەك خۆم هەرئەو بۆچوونەم پیٚ چاکە، چونکە شتی وا بۆ پەیامبەران زۆر نەگونجاوە، ئەی چۆن دەبێت خانەوادەی پێغەمبەران هەر ئەوەندە لە بیروباوەڕو عەقیدە تێگەیشتبن؟ چۆن دەبیٚ نەزانن چ شتێك دەبێتە شیرك بۆ خوا؟ چۆن دەبێت نەزانن کە هەموو شتێك بەدەستی خوایە؟ چۆن دەبێت خوا بیبەویٚ منداڵ بمرێنیٚ و، شەیتان نەیەڵێت؟ تەنانەت ئەمە زۆر سامناك ترە لە خواردنی درەختەکەی بەهەشت، چونکە/ یەکەم: ئەو خواردنە نابێتەشیرك. دووەم: پاکانەیشی بۆ کراوە بە ئایەتی (ولم نجد له عزما). سێیەم: دەگۆنجێت کە سەرەتای ئایەتەکە باس لەئادەم و حەوابێت و، ناوەڕاستەکەی بۆ گێڕانەوەی شتێك بێت کە لە سروشت و تایبەتمەندی نەوەکانی ئەوان بێت. واتە: وەچەکانمانیان ، چونکە بنیادەمن لە سرووشتیانەوە نزیکە داوای شتیوا بکەن و، پاشانیش بە پێچەوانەوە ڕەفتار بکەن.

**خواکانتان - بەدەرلە خوا- بیٚتوانان:**

﴿[١٩١] ایشرکون ما لا یخلق شیئا﴾ ئایا دەبیٚ شتێك بکەنە هاوبەشی خوا ، کە نەتوانیٚ هیچ شتێك دروست بکات؟ ﴿وهم یخلقون﴾ دەبیٚ خۆشیان- هاوبەشەکان - دروست بکرێن ، واتە: خۆ ئەوبتانە خۆیان دروست کراون، ئیتر چۆن ئەپەرسترێن؟ ﴿[١٩٢] ولایستطیعون لهم نصرا﴾ و بەهیچ شێوەیەکیش ناتوانن هیچ یارمەتی و کۆمەکی پەرستیارەکان بدەن ﴿ولا انفسهم ینصرون﴾ تەنانەتی ناتوانن کۆمەك بەخۆیشیان بکەن و، خراپەیەك لە خۆیان بگێرنەوە، ئیتر چۆن دەیانپەرستن ﴿[١٩٣] وإن تدعوهم إلى الهدی﴾ خۆ ئەگەر بانگیشیان بکەن بۆ ئەوەی ڕییٚ ڕاستتان نیشان بدەن ﴿لا یتبعوکم﴾ هیچ نابیسن و بە دەنگتانەوە نایەن ﴿سواء علیکم أدعوتموهم أم انتم صامتون﴾ بانگیان بکەن ، یابێدەنگبن و دەنگ نەکەن، یەکبارە بۆتان، واتە: داوایان لیٚ بکریٚ، یان نەکریٚ یەکسانە ﴿[١٩٤] إن الذین تدعون من دون الله عباد أمثالکم﴾ بێگومان ئەوانەی کەئێوە بێجگە لەخوا بانگیان ئەکەن و ئەیانپەرستن هەر بەندەو دروستکراون وەك خۆتان ﴿فادعوهم فلیستجیبوا لکم﴾ دەسا بانگیان بکەن با وەڵامتان بدەنەوە ﴿إن کنتم صادقین﴾ ئەگەر ئێوە ڕاست ئەکەن ئەوانە شتێکیان بەدەستە ﴿[١٩٥] ألهم أرجل یمشون بها﴾ ئا خۆ ئەوانە- لانی کەم -دەتوانن وەك ئێوە لەسەرپیٚ بچن بۆ پێویستییەکانیان ﴿ام لهم اید یبطشون بها﴾ یان دەستیان هەیە هەڵمەتی پیٚ بەرن بۆ ڕەتدانەوەی نەیارو ناحەزیان ﴿أم لهم اعین یبصرون بها﴾ یان چاویان هەیە پێی ببینن؟ ﴿أم لهم آذان یسمعون بها﴾ یان گوێیان هەیە پێی ببیسن؟" جائەگەر ئەوانە-هەرهیچ نەبیٚ- بە ئەندازەی ئێوە تواناو دەسەڵاتیان نیە، باشە! چۆن هاواریان لێدەکەن وئەیانپەرستن ؟ ﴿قل أدعوا شرکاءکم ثم کیدون﴾ بڵیٚ:دەسا هاوار لە بتەکانتان بکەن ، پاشانیش -بەهەمووتانەوە- نەخشەو پلانی لەناوبردنم دارێژن ﴿فلا تنظرون﴾ بە هیچ شێوەیەکیش مۆڵەتم مەدەن، واتە: ئێوە هەرچی بکەن، من بە خەیاڵمدا نایەت و نرخی بۆ دانانێم، چونکە خوای گەورە لەمەکرو حیلەی ئێوە دەمپارێزیٚ ﴿[١٩٦] إن ولیی الله الذی نزل الکتاب﴾ بە ڕاستی گەورەو سەرپەرستیکاری من هەر ئەوخوایە کە:

ئەم قورئانەی ناردۆتە خوارەوە ﴿وهو يتولى الصالحين﴾ و هەر بۆخۆیشی چاودێریی و سەرپەرشتی صاڵحان و
چاکان ئەکات ﴿١٩٧ والذين تدعون من دونه﴾ خۆ ئەوانەی ئێوە -کە بێجگە لە خوا- هاواریان لێ دەکەن ﴿لا
يستطيعون نصركم﴾ نەدەتوانن یارمەتی ئێوە بدەن ﴿ولا انفسهم ينصرون﴾ ونەیارمەتی خۆیشیان بدەن ﴿١٩٨ وإن
تدعوهم إلى الهدى لايسمعوا﴾ ئەگەر داوای هیدایەتیان لێ بکەن بۆ ئەوەی خێرتانی تێدایە ، نابیسن ، ئیتر چۆن
دەتانەوێ وەڵامتان بدەنەوەو یارمەتیتان بدەن ﴿وتراهم ينظرون إليك﴾ وادەبینی - بە ڕەواڵەت- بۆت دەڕوانن
﴿وهم لا يبصرون﴾ کەچی هیچ نابینن لە هەقیقەتدا.

### لەهەڵەی یەکتر چاو بپۆشن:

﴿١٩٩ خذ العفو وأمر بالعرف﴾ هەمووکات بۆ
جێبەجێکردنی ئیش وکارەکانت ڕێگەی ئاسان بگرە بەرو،
عەفوو لێبوردنیش ڕەوشتت بێ و، هەردەم فەرمان بەچاکە
بدە ﴿وأعرض عن الجاهلين﴾ و لەخەڵکانی نەفامیش روو
وەرگێڕەو، سەر مەخەرە سەریان و، لە ڕێگەی
بانگەوازە(دەعوە)وە بڕۆو هەنگاو بنێ ، واتە: پاش بەڵگە
هێنانەوە بۆیان، ئەگەر هەر سوور بوون لە سەر کاری نەفامی
خۆیان، پشت گوێیان بخەو بەکاری دەعوەوە خەریکبە ﴿٢٠٠
وإما ينزغنك من الشيطان نزغ﴾ وەرکاتێکیش لە
شەیتانەوە وەسوەسەیەکت بەدڵا هات و، هەڵی نایت
بۆکردنی کارێکی ناشەرعیی و حەرام ﴿فاستعذ بالله﴾ تۆش
پەنا هەر بەخوا بەرەو خۆت بدە لای ئەو ﴿إنه سميع عليم﴾
چونکە بە ڕاستیی ئەو زۆر ژنەواو، زۆر زانایە بەگوتارو
ڕەفتاری مرۆڤ ﴿٢٠١ إن الذين اتقوا﴾ بێگومان ئەوانەی کە لە
شیرك و کاری ناشەرعیی پارێزدەکەن ﴿إذا مسهم طائف من
الشيطان﴾ هەر کە وەسوەسەو خەتەراتێکیان لە شەیتانەوە
پێ دەگا ﴿تذكروا﴾ بەخێرایی دادەچڵەکێن و بیرئەکەنەوەو
لەسەر ڕێگەی خوا پێدادەگرن ﴿فإذاهم مبصرون﴾ دەبینی -زۆر زوو- چاویان ئەکرێتەوەو لەگوناهان دەگەڕێنەوە
﴿٢٠٢ وإخوانهم يمدونهم في الغي﴾ برا خراپە ئادەمییەکانیان -ئەوانەی کە هەردەم بەدوای شەیتاندا ئەڕۆن و لەخوا
ناترسن- هاوکارییان دەکەن و تێدەکۆشن تازیاتر سەرلێشێواویان بکەن ﴿ثم لا يقصرون﴾ ئیتر کۆتا ناکەن
وناگەڕێنەوە بۆ ڕێی هەق ﴿٢٠٣ وإذا لم تأتهم بآية﴾ وەهەر کات داوای موجیزەیەکت لێبکەن و تۆیش بۆت ئەنجام
نەدرێت ﴿قالوا لولا اجتبيتها﴾ ئەڵێن: باشە! بۆ خۆت ئەی موحەممەدﷺ بۆرێکی ناخەی؟ ﴿قل إنما اتبع ما يوحى
إلى من ربى﴾ پێیان بڵێ: من تەنها پەیڕەوی لەوە ئەکەم لە لایەن پەروەردگارمەوە بە وەحی و سروش بۆم دێ ﴿هذا
بصائر من ربكم﴾ ئەم قورئانەو ئایەتەکانی کۆمەڵە مەشخەڵێکی پەروەردگارتن، ئایەت و موجیزەی تری ناوێ و

الجزء التاسع — سورة الأعراف

إِنَّ وَلِـِّۧيَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي نَزَّلَ ٱلۡكِتَٰبَۖ وَهُوَ يَتَوَلَّى ٱلصَّٰلِحِينَ ١٩٦
وَٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَسۡتَطِيعُونَ نَصۡرَكُمۡ وَلَآ
أَنفُسَهُمۡ يَنصُرُونَ ١٩٧ وَإِن تَدۡعُوهُمۡ إِلَى ٱلۡهُدَىٰ لَا يَسۡمَعُواْۖ
وَتَرَىٰهُمۡ يَنظُرُونَ إِلَيۡكَ وَهُمۡ لَا يُبۡصِرُونَ ١٩٨ خُذِ ٱلۡعَفۡوَ وَأۡمُرۡ
بِٱلۡعُرۡفِ وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡجَٰهِلِينَ ١٩٩ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ
ٱلشَّيۡطَٰنِ نَزۡغٞ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِۚ إِنَّهُۥ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ٢٠٠ إِنَّ
ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ إِذَا مَسَّهُمۡ طَٰٓئِفٞ مِّنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ تَذَكَّرُواْ
فَإِذَا هُم مُّبۡصِرُونَ ٢٠١ وَإِخۡوَٰنُهُمۡ يَمُدُّونَهُمۡ فِي ٱلۡغَيِّ ثُمَّ
لَا يُقۡصِرُونَ ٢٠٢ وَإِذَا لَمۡ تَأۡتِهِم بِـَٔايَةٖ قَالُواْ لَوۡلَا ٱجۡتَبَيۡتَهَاۚ
قُلۡ إِنَّمَآ أَتَّبِعُ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّ مِن رَّبِّيۚ هَٰذَا بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمۡ
وَهُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ٢٠٣ وَإِذَا قُرِئَ ٱلۡقُرۡءَانُ
فَٱسۡتَمِعُواْ لَهُۥ وَأَنصِتُواْ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ٢٠٤ وَٱذۡكُر رَّبَّكَ
فِي نَفۡسِكَ تَضَرُّعٗا وَخِيفَةٗ وَدُونَ ٱلۡجَهۡرِ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ بِٱلۡغُدُوِّ
وَٱلۡأٓصَالِ وَلَا تَكُن مِّنَ ٱلۡغَٰفِلِينَ ٢٠٥ إِنَّ ٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ
لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِهِۦ وَيُسَبِّحُونَهُۥ وَلَهُۥ يَسۡجُدُونَ ۩ ٢٠٦ سجدة

بەسە بۆ ڕێ دەرکردن ﴿وهدى ورحمة لقوم يؤمنون﴾ و ڕێ نیشاندەر و میهرەبانیە بۆ کۆمەڵێك باوەڕ دێنن وکاری پێدەکەن .

**کەقورئان دەخوێنرێ گوێی بۆ رادێرن:**

﴿٢٠٤ وإذا قرئ القرآن فاستمعوا له﴾ وە هەر کە ئەم قورئانە دەخوێندرێ زۆر بەوردیی - ئێوە ئەی ئیمانداران! - گوێی بدەنێ ﴿وانصتوا لعلكم ترحمون﴾ و کڕو بێدەنگ بن و هەراو هوریا مەکەن، سا بەڵکو خوا لەبەر ڕێزلێنان و قایلبوون بەگەورەیی و ڕێزداریی قورئان، بەزەیی پێتانا بێتەوە، واتە: بە پێچەوانەی هاوبەشدانەرەکانەوە ، کە ئەوان لەکاتی خوێندنی قورئاندا دەیکەنە هەراو هۆسەو دەڵێن: (لا تسمعوا لهذا القرآن والغوا فيه..).

**بەیانیی و ئێوارە بەترسەوە لەخوا بپاڕێوە:**

﴿٢٠٥ واذكر ربك في نفسك تضرعا وخيفة ودون الجهر من القول﴾ بەلارە ملێ و ترسەوەو بەنهێنی و لەسەرخۆ، هەمیشە گەورەیی خوای پەروەردگارت یادبکە ، لە فەرموودەیەکی(متفق علیە)شدا هاتووە: کە (ئەبو موسای ئەشعەری) دەڵێ: لە سەفەرێکدا هەندێ لە خەڵکەکە لەدۆعاکردندا دەنگیان بەرز کردەوە، پێغەمبەریش ﷺ گوێی لەخەڵکەوە بوو بەدەنگی بەرز دۆعایان کرد! فەرمووی: ((أيها الناس إربعوا (إرفقوا)، على أنفسكم، فإنكم لا تدعون أصم ولا غائبا، إن الذي تدعونه سميع قريب)) واتە: بە هێواش و لەسەرخۆ دۆعابکەن، چونکە ئێوە لەکەسێکی کەڕو دوور داواناکەن، خوای ئێوە نزیك و ژنەوایە. ﴿بالغدو والآصال﴾ هەموو بەرەبەیان و، دەماو دەمی ئێوارانێك ﴿ولا تكن من الغافلين﴾وهەرگیز لە بێ ئاگایان مەبە، واتە: لەوانە پەند وەرناگرن.

**ئاگادارییەك:** ئیمامی ئەحمەد لە (ئەبوو هورەیرە) دەڵێ: پێغەمبەر نوێژێکی بەدەنگی بەرز خوێندو، پاشان فەرمووی: ئەرێ هیچ کەسێکتان لەگەڵ من سوورەتی (فاتحە)و سوورەتی تری خوێند؟ پیاوێك گوتی بەڵی من خوێندم، فەرمووی: باشە ! بۆ دەبێ لەگەڵ من قورئان بخوێنرێ ؟! واتە: ئێوە گوێ بگرن بۆپێشنوێژەکە، ئەوسا خەڵکەکەش وازیان لە خوێندنی سوورەتی (فاتیحە)و قورئانی تر هێنا لەونوێژانەدا بەدەنگی بەرز دەخوێنرێن . (عەبدوڵڵای کوری موبارەك)یش دەڵێ: لە نوێژە(جەهرییە) کاندا، نابێ (مەئموم) هیچ شتێك بخوێنێ، ئیمامی (مالیك)و، ئیمامی (شافیعی) لە قەولی(قەدیم)یداو، ریوایەتێك لە ئیمام (ئەحمەد)یشەوە هەروا دەڵێن، بەڵام (ئەبوحەنیفە)و ئیمامی (ئەحمەد) دەڵێن: کە(مەئموم) هەرنوێژێك (جەهریی، یان سریی) بەکۆمەڵ بیکات (قیرائە)ی لەسەر نیە. بەڵام ئیمامی (بوخاریی) دەڵێ: هەموو کاتێك (قیرائە)ی لەسەرە. (ئیبن جەریر)یش دەڵێ: مەبەست لەم کڕوو بێ دەنگیە لەکاتی خوێندنی قورئاندا: کڕوو بێدەنگییە لەکاتی نوێژو وتارەکانی جەژنی قوربان و، جەژنی رەمەزان، ڕۆژی هەینیدا، چونکە فەرموودە هەیە فەرمان دەدا کە لەپشت پێشنوێژو، لەکاتی وتارەکاندا بێدەنگ بن.

﴿٢٠٦ إن الذين عند ربك﴾ ئەو فریشتانەی کەلای پەروەردگارتن و نزیکن لە میهرەبانی ئەوەوە ﴿لا يستكبرون عن عبادته﴾ هەرگیز خۆ بە گەورە نازانن و سەر پێچی لە پەرستنی ئەوناکەن وەك هاوبەش دانەرەکان نین کە دەعیە نەهێڵێ بیپەرستن ﴿ويسبحونه﴾ لە هەر شتێ شایستەی ئەو نەبێ بەپاك و خاوێن ڕایئەگرن و، تەنها بەگەورەیی ئەو قایل دەبن ﴿وله يسجدون﴾ هەر بۆ ئەویش سوژدەو کڕنووش ئەبەن و، تەنها ئەو دەپەرستن، دەسا ئێوەش وابن.

**جەماوەری زانایان ئەڵێن:** ئایەتی(وله يسجدون) بۆ قورئان خوێنەران و گوێگران جێی سوژدەیە، وە لە دیاریکردنی جێگای سوژدەکانی قورئان و ژمارەیاندا، زاناکان کێشەیانە، بەڵام لای سەرووی بۆچوونەکان ئەمەیە کە: سووژدەکان لەقورئاندا پازدەن، لە کۆتایی ئەم سوورەتی (ئەعراف)ەوە دەسپێی دەکەن و لە کۆتایی سوورەتی

(عەلەق)دا تەواو دەبن، مالیکی و شافعیەکان دەڵێن: لە تەواوی ئەو پازدە شوێنەدا لە کاتی خوێندنیاندا سوژدە بردن سوونەتە.

لە کۆتایی ئەم سوورەتەوە زۆر سوپاسی بێ پایانی خوای کارزان دەکەم کە یاریدام بۆ تەواوکردنی تەفسیرەکەی.

*** *** ***

## ٨- سوورەتی ( ئەنفال )

## مەدەنی یەو ( ٧٥ ) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتە بایەخ بەبەرنامەو لایەنی یاسا دەدا، بەتایبەتی یاسا بۆجیهاد، چارە بۆ هەندێ بابەت دادەنێت کەپاش ڕوودانی جەنگەکان پەیدادەبن، بۆنموونە: یاسای جەنگ دادەبەزێنێت- ئەگەر ناچارکران بۆ جەنگ ولەگەڵ چەند ڕێنمایییەکی تردا بۆ کاتی ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ دوژمنانی دینی خوادا.. دەستور و یاسا بۆ دیل و دەسکەوتەکانی جەنگ. ئەم سوورەتە پاش ڕووداوەکەی(بەدر) هاتە خوارێ کە: بەراستیی بە ڕووداوێکی زۆر پیرۆز لەمێژووی موسڵماناندا دەژمێردرێ، چونکە دەرگای والآ کرد لەبەردەم گشت غەزاکانی تردا، سوپاس و شوکرانە بژێری بوو لەبەرامبەر ئەو سەرکەوتنە پیرۆزەوە.. تەنانەتی هەندێ لە هاوەڵان بەم سوورەتەیان دەگوت: سوورەتی (بەدر)، چونکە زۆر بەدرێژە باسی ڕووداوەکەی ڕۆژی بەدر ئەکات، شیاوی باسە ڕووداوەکە لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی دووەمی کۆچیدا بوو، ڕووداوەکەش بە سەرکەوتنی هەق دەژمێردرێ بەسەر ناهەق و پڕوو پووچدا، بەر پەرچ دانەوەیەکیشە بۆ ئەو هەموو سەرکێشی و دەستدرێژییە دەکرایە سەر موسڵمانەکان، هۆی ڕزگار کردنی ئەو پیرەمێردو ژن و منداڵانە بوو کە: بێ دیفاع مابوونەوەو هەر ڕۆژەی بروبیانویەکیان پێ دەگرتن، بەتایبەتی ئەوانەی لە مەککەدا لە بەر دەستیاندا بوون و دەیانگوت: (ربنا أخرجنا من هذه القرية الظالم أهلها..) ئەوسا خوای میهرەبان وەڵامی دانەوەو ئەو غەزایەی بۆ ڕێکخستن و، دەرەنجام بوو بەمایەی سەرکەوتنی موسڵمانەکان بە سەر بتپەرستەکاندا، لەگەڵ کەمی ژمارەیان و ناتەواوی چەك و تەقەمەنی ئەوکاتەیان بەرامبەر بە دوژمنان و، خۆئامادە نەکردنیان بۆ جەنگەکە، چونکە موسڵمانەکان بۆ ئەوەهاتبوون ماڵ وسامانە زەوتکراوەکەیان لە قورەیش بسێننەوە.. بۆیە ڕێگەیان لەکاروانەکە گرت، بەڵام دەرەنجام ئەو جەنگە لابەلایە ڕوویدا.

**بەکورتیی:** ئەو ڕووداوەی (بەدر)ی گەورە جێگای تایبەتی خۆی هەیە لەمێژووی موسڵماناندا، چونکە پۆزەی دوژمنانی دینی خوای تێدا شکێنراو، بوو بەوانەی سەرکەوتن و عیززەت و سەرفرازی هەردوو دونیا بۆ موسڵمانان. لە کاتی گێڕانەوەی ڕووداوەکەدا شەش جار خوای کارجوان -ناوبەناو- بە (یاأيها الذين آمنوا..) بانگ دەکاتە موسڵمانەکان کە: زیاتر خۆ بگرن و ئارامیان ببێ لە بەرامبەر ئەو ڕووداوانەوە بەرەنگاریان دەبنەوە، چونکە پیرۆزیی و عیززەت لە ڕوو بەڕوو بوونەوەو لە خۆ ئامادە کردندایە.. دەبێ ئەمەش بزانن ئێوە کە داوای بڕواو ئیمان دەکەن، نابێ هیچکات خافڵ بن لە دوژمنتان، بۆیە جارێ داوایان لێدەکات کە هیچکات لە ڕوو بەڕوو بوونەوەدا هەڵنەیەن و پشت هەڵنەکەن، ئەگینا بە توندترین شێوە سزاو تۆڵە دەدرێن ، جارێکی تر داوایان لێ دەکات گوێ ڕایەڵیی خواو پەمیامبەر بن ﷺ و، سەرپێچی لەفەرمانەکانیان نەکەن، جارێکی تریش پێیان دەڵێت ئەو بەرنامەی پەیامبەر ﷺ ئەوانی بۆ بانگدەکات مایەی زیندەگیی و، ژیان و ژیوارێکی خۆش و بەختیاریی هەردووجیهانە.

بانگیان دەکات کە: هەرگیز نهێنی یەکانی خۆیان نەخەنە بەردەستی بێ بڕوایان و، لەملاو لەولا بڵاویان نەکەنەوە هەتا دوژمن نەزانێ خەریکی چین، چونکە بڵاوکردنەوەو درکاندنی نهێنییەکان دەبێتە خیانەت و گزیکاری لە خواو لە پەیامبەر ﷺ و لە موسڵمانان . پێیان دەڵێت: کە"تەقوا" مایەی هەموو سەرکەوتنێکەو ، بەرزترین بەروو بووی دەبێ، کە وابوو هەمیشە دەبێ لە خوا بترسن و ، لەهەموو جموجوڵەکانتان بەئاگابن ، پێیان دەڵێت: هەرگیز پەرت و تەفرەقەو پەڕاگەندە نەبن، ئەگینا تێدەشکێن و هێزو پێزتان بە با دەڕوات، چونکە هەموو سەرکەوتنێك لەپاڵ وەحدەت و یەکریزی دایە. لە کۆتاییدا پێیان دەڵێت کە لەناوخۆیاندا یەکتریان خۆش بوێ، دەڵێ: گشت موسڵمانانی دنیا، بە یەك گەل و، یەك ئوممەت دەدرێنە قەڵەم.. پێشیان دەڵێ: نابێ لە نێوان موسڵمانان و بێ باوەڕاندا پەیوەندی لەسەرحسابی دین وئاقیدە هەبێ، ئەگەرچی خزمایەتیش لە نێواندا هەبێ. ئەمە کورتەی "ئەهداف" و ئامانجەکانی سوورەتی (ئەنفال) بوو. لەخوای دلۆڤان دەخوازم سوود بەخشبێت.

الجزء التاسع — سورة الأنفال

سورة الأنفال (٨) آياتها ٧٥

بسم الله الرحمن الرحيم

حزب ١٨
يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْأَنفَالِ قُلِ الْأَنفَالُ لِلَّهِ وَالرَّسُولِ فَاتَّقُوا اللَّهَ
وَأَصْلِحُوا ذَاتَ بَيْنِكُمْ وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ إِن كُنتُم
مُّؤْمِنِينَ ﴿١﴾ إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَجِلَتْ
قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَانًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ
يَتَوَكَّلُونَ ﴿٢﴾ الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ
يُنفِقُونَ ﴿٣﴾ أُولَٰئِكَ هُمُ الْمُؤْمِنُونَ حَقًّا لَّهُمْ دَرَجَاتٌ عِندَ
رَبِّهِمْ وَمَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٤﴾ كَمَا أَخْرَجَكَ رَبُّكَ
مِن بَيْتِكَ بِالْحَقِّ وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ لَكَارِهُونَ ﴿٥﴾
يُجَادِلُونَكَ فِي الْحَقِّ بَعْدَ مَا تَبَيَّنَ كَأَنَّمَا يُسَاقُونَ إِلَى الْمَوْتِ
وَهُمْ يَنظُرُونَ ﴿٦﴾ وَإِذْ يَعِدُكُمُ اللَّهُ إِحْدَى الطَّائِفَتَيْنِ أَنَّهَا
لَكُمْ وَتَوَدُّونَ أَنَّ غَيْرَ ذَاتِ الشَّوْكَةِ تَكُونُ لَكُمْ
وَيُرِيدُ اللَّهُ أَن يُحِقَّ الْحَقَّ بِكَلِمَاتِهِ وَيَقْطَعَ دَابِرَ الْكَافِرِينَ
﴿٧﴾ لِيُحِقَّ الْحَقَّ وَيُبْطِلَ الْبَاطِلَ وَلَوْ كَرِهَ الْمُجْرِمُونَ ﴿٨﴾

١٧٧

## ئەنفال چییە؟

﴿بسم الله الرحمن الرحیم* [١] یسألونك عن الأنفال﴾ هاوەڵان لەبابەت ئەو دەستکەوتەی جەنگی (بەدر)ەوە لێتدەپرسن: ئاخۆ بۆ کێیبێ و، چۆن دابەش دەکرێ ؟ ﴿قل الأنفال لله والرسول﴾ پێیان بڵێ: حوکمی(ئەنفال) بە دەست خواو پەیامبەرە، واتە: شێوەی دابەشکردنەکەی تایبەتە بەوانەوە ﴿فاتقوا الله﴾ دەبێ ئێوەش لەخوا ترستان هەبێ و، سەرپێچی لە بڕیارەکانی نەکەن ﴿واصلحوا ذات بینکم﴾ ونێوان خۆتان بسازێنن و، دەبێ گشتان یەکبن و جیاوازی و کێشەتان نەبێت و، یەکتر ئاشت بکەنەوە ﴿واطیعوا الله ورسوله﴾ و گشت کاتێ لە فەرمانی خواو، لەقسەی پەیامبەری ئەو، گوێڕایەڵیی بکەن ، بەتایبەتی دەربارەی دەستکەوتەکەی بەدر. (عوبادە) دەڵێت: ئەم ئایەتە لەبارەی ئێمەی ئەهلی بەدرەوە هاتە خوارێ، چونکە ئێمە بووین لە شێوەی دابەشکردنی دەستکەوتەکەدا کێشەو ناکۆکیمان بوو، ئەوسا خوایش ئەنفالەکەی لێ سەندینەوەو خستیە بەر دەست پەیامبەری خۆی ﷺ، پێشەوا (ئەحمەد) ریوایەتی کردووە ﴿إن کنتم مؤمنین﴾ کە بڕواتان هێناوە، دەبێ ملکەچبن.

## موسڵمانە ڕاستەکان بناسە:

﴿[٢] إنما المؤمنون الذین إذا ذکرالله وجلت قلوبهم﴾ باوەڕدارانی ڕاستەقینەو دڵسۆز هەر ئەوانەن کە هەرناوی خوا هێنرا، دڵیان لەبەر گەورەیی ئەو دەکەوێتە لەرزەو، ترسی لێدەنیشێت ﴿وإذا تلیت علیهم آیاته﴾ هەرکە ئایەتەکانیشی دەخوێنرێنەوە بەسەریاندا ﴿زادتهم إیمانا﴾ باوەڕیان زیادو بەهێز دەبێ. ئیمامی (بوخاریی) و، گەلێ لە زاناکانی تر ئەم جۆرە ئایەتانە دەکەنە بەڵگەی زیادبوونی ئیمان و باوەڕ ، هەر وەکو جەماوەری ئەم ئوممەتەیش هەر

ڕایان وایە، تەنانەتی پێشەوا (شافعی) و، ئیمامی (ئەحمەد) و هەندێکی دی باسی (ئیجماع)ی لەسەر دەکەن. ﴿وعلى ربهم يتوكلون﴾ هەر بەپەروەردگاریشیان پشت دەبەستن، واتە: پشت و پەنایان هەر ئەوە ﴿[٣] الذين يقيمون الصلاة﴾ ئەوانەشن کە بەرێك و پێکی نوێژ ئەکەن ﴿ومما رزقناهم ينفقون﴾ و لەو بژێوەیش بەشمانداون لەرێی خوادا دەبەخشن، بەناوی زەکاتەوە بێت، یان بەناوی صەدەقەوە ﴿[٤] أولئك هم المؤمنون حقا﴾ باوەڕدارانی ڕاستەقینە هەر ئەوانەن، چونکە کردەوەیشیان خستۆتە پاڵی ئیمانەکەیان ﴿لهم درجات عند ربهم ومغفرة و رزق كريم﴾ بەلای پەروەردگاریانەوە پلەو پایە یەکی زۆرو، لێبوردن و ڕۆزیی بەردەوام و چاك و پاکیشیان هەیە.

ڕێنمایەکانی ئایەتی (١-٤):

١- تەقواو خۆ پارێزی لەبەزاندنی بڕیارەکانی خوا.

٢- ڕێکخستنی نێوان موسڵمانان و، پاراستنی تەبایی و ئاشتیی نێوانیان.

٣- بە یەکخواپەرستیی و تاعەت، ئیمان زیاد ئەکا، بە سەرپێچی و نافەرمانیش ئیمان کەم دەکا.

٤- باوەڕداران هەندێکیان باوەڕیان کامڵە ، هەندێکیشیان کەم و کورت و ناتەواوە.

٥- نیشانەی ئیمانکامڵی ئەمەیە کە لەم ئایەتانەدا ڕوونکراوەتەوە.

## پەیڕەویی لە پێغەمبەر ﷺ ، بکە بە پیشەی خۆت:

﴿[٥] كما أخرجك ربك من بيتك بالحق وإن فريقا من المؤمنين لكارهون﴾ هەرچۆنێ دەستەیەك لەموسڵمانەکان ، دەرچوونی تۆیان لە ماڵەکەت (لە مەدینە) پێناخۆش بوو، ئەگەرچی بەفەرمانی پەروەردگارت بووو کارێکی ڕەواو دروستیش بوو، هەر ئاواش دابەشکردنی دەستکەوت و (ئەنفال)ـەکەیان - بەو شێوەیە- پێ ناخۆش بوو، بۆ دواییش بەخێریان تەواو بوو ﴿[٦] يجادلونك في الحق بعد ما تبين﴾ هێمان -پاش دەرکەوتنی هەق وڕاستیی- ئەوان دەمەقاڵێ و موجادەلەت لەگەڵ دەکەن سەبارەت بەو بڕیارە ڕاستەیە " بڕیاری جەنگ لەگەڵ کافراندا"دەڵێن: خۆ ئێمە بۆ جەنگ نەهاتووین، بەڵکو هەر بۆ کاروانەکە هاتووین، جا لەبەرئەوە دەبێ بگەڕێینەوە" واتە: ئەگەر چی پێشیان خۆش نەبوو تۆ خۆت خاوەنی (ئەنفال)ـەکە بیت و بەکێی ئەدەیت بیدەی، بەڵام خێر لەوە دابوو ﴿كأنما يساقون إلى الموت﴾ وا دەمەقاڵێ و ململانێت لەگەڵ دەکەن دەڵێیت بۆ مردنیان لێدەخوڕن ﴿وهم ينظرون﴾ و بە ئاشکرا مردن دەبینن و لە پێش چاویانەوەیە، چونکە ئەمان هەم ژمارەو هەم چەکیان لە بێ باوەڕەکان کەم تر بوو ﴿[٧] وإذ يعدكم الله إحدى الطائفتين أنها لكم﴾ ئەی لەبیرتانە ! خوا بەڵێنی یەکێ لەدوو تاقمەکەی پێدان- کاروانەکە، یان سوپاکە- ئەوە بوو کاروانێك بە بازرگانییەکی زۆرەوە لە وڵاتی شامەوە- بە سەرۆکایەتی ئەبوسوفیان- دەگەڕایەوە ، پەیامبەریش ﷺ بەوەحیی و بەسروش ئاگادار کرابوو کە: یەکێ لەو دوودەستەیە- سوپاکە، یان قافڵەکە - دەسکەوتی ئێوە دەبێ، ئەوسا پەیامبەریش ﷺ مەشورەتی بەهاوەڵانی کرد، چی بکەن باشە؟ ئەوانیش لەبەرئەوە خۆیانیان ئامادە نەکرد بوو بۆ جەنگ، حەزیان لە قافڵەکە دەکرد. ئینجا کە لەودەمەدا کەهەراوکێشەیان لەناوپەیدا بوو، پەیامبەریش ﷺ تووڕەو دڵگرانبوو لێیان، پاشان هاوەڵان ئامادەیی خۆیانیان دەربڕی بۆ جەنگەکەو، تەنانەتی بیشیانخاتە دەریاوە هەرئامادەن.. پاشان ئەویش موژدەی سەرکەوتنی پێدان (سیرەی ئیبن هیشام). ﴿وتودون أن غير ذات الشوكة تكون لكم﴾ حەزتان دەکرد ئەوقەی دەستە بێ چەکەکە بن، واتە: کاروانەکە، نەك لەشکرو سوپاکە ﴿ويريد الله أن يحق الحق بكلماته﴾ خۆ خواش دەیەوێ بەڵێنەکەی خۆی بچەسپێنێ، دەیەوێ دینی هەق وڕاست (دینی ئیسلام) زاڵ بکا ﴿ويقطع دابر الكافرين﴾ و ڕەگ و ڕیشەی بێ باوەڕانیش ببڕێ ﴿[٨] ليحق

﴿الحق ويبطل الباطل﴾ ئەوە دەكا هەتا هەق و ڕاستیی سەقامگیر بكاو، ناڕەواو ناهەقیش، هەڵوەشێنێ ﴿ولو كره المجرمون﴾ با تاوانبارانیش پێیان ناخۆش بێت.

**هانا دەبەنە بەر خوا، ئەویش دێت بە هانایانەوە:**

﴿[٩] إذ تستغيثون ربكم﴾ وەبیر بێنن ئەودەمە كەناڕەحەت ودڵ نیگەران بوون و، هاناتان بۆپەروەردگارتان بردو پێغەمبەریش - وەك موسلیم هێناویەتی- ڕوویكردە ڕووگەو فەرمووی: ((اللهم انجزلی ما وعدتنی، اللهم إن تهلك هذه العصابة من أهل الإسلام فلن تعبد فی الأرض أبدا)) خوایا! بەڵێنەكەی خۆتم بۆ جێبەجی بكە، خوایا! ئەگەر ئەم دەستەیە لەناوبچێت، ئیتر تۆ هەرگیز ناپەرسترێیت، جا لەودەمەدا ئەم ئایەتە هاتوو فەرمووی: ﴿فاستجاب لكم﴾ ئەوا پەروەردگارتان وەڵامی دانەوە ﴿انی ممدكم بألف من الملائكة مردفين﴾ كە: دڵنیابن بە شوێن یەكدا هەزار فریشتە بۆ پشتیوانیتان دەنێرم ﴿[١٠] وما جعله الله إلا بشرى﴾ و خوا ئەوەی هەر بۆ ئەوەكرد كە ببێتە مژدەی سەركەوتنتان ﴿ولتطمئن به قلوبكم﴾ ودڵیشتان ئۆقرە بگرێ پێی ﴿وما النصر إلا من عندالله﴾ و ئەوەش بزانن كە سەركەوتن و یارمەتیش تەنها لای خوایە ﴿إن الله عزيز حكيم﴾ بە ڕاستیی خوا زۆر بەتواناو بەدەسەڵاتە، زۆریش كارجوان و لەكارزانە، ئەوەتە جیهاد فەرزدەكات هەتا نەیارو دوژمنەكانتان سەركوت بین.

إِذۡ تَسۡتَغِيثُونَ رَبَّكُمۡ فَٱسۡتَجَابَ لَكُمۡ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلۡفٖ
مِّنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ مُرۡدِفِينَ ﴿٩﴾ وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشۡرَىٰ
وَلِتَطۡمَئِنَّ بِهِۦ قُلُوبُكُمۡۚ وَمَا ٱلنَّصۡرُ إِلَّا مِنۡ عِندِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ
عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿١٠﴾ إِذۡ يُغَشِّيكُمُ ٱلنُّعَاسَ أَمَنَةٗ مِّنۡهُ وَيُنَزِّلُ
عَلَيۡكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ لِّيُطَهِّرَكُم بِهِۦ وَيُذۡهِبَ عَنكُمۡ رِجۡزَ
ٱلشَّيۡطَٰنِ وَلِيَرۡبِطَ عَلَىٰ قُلُوبِكُمۡ وَيُثَبِّتَ بِهِ ٱلۡأَقۡدَامَ ﴿١١﴾
إِذۡ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ أَنِّي مَعَكُمۡ فَثَبِّتُواْ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْۚ
سَأُلۡقِي فِي قُلُوبِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلرُّعۡبَ فَٱضۡرِبُواْ فَوۡقَ
ٱلۡأَعۡنَاقِ وَٱضۡرِبُواْ مِنۡهُمۡ كُلَّ بَنَانٖ ﴿١٢﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ
شَآقُّواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥۚ وَمَن يُشَاقِقِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَإِنَّ ٱللَّهَ
شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴿١٣﴾ ذَٰلِكُمۡ فَذُوقُوهُ وَأَنَّ لِلۡكَٰفِرِينَ
عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٤﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ
كَفَرُواْ زَحۡفٗا فَلَا تُوَلُّوهُمُ ٱلۡأَدۡبَارَ ﴿١٥﴾ وَمَن يُوَلِّهِمۡ يَوۡمَئِذٖ
دُبُرَهُۥٓ إِلَّا مُتَحَرِّفٗا لِّقِتَالٍ أَوۡ مُتَحَيِّزًا إِلَىٰ فِئَةٖ فَقَدۡ بَآءَ
بِغَضَبٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَمَأۡوَىٰهُ جَهَنَّمُۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ﴿١٦﴾




**خوا لە بەدردا بۆ ئۆقرەی دڵ هاوەڵانی خەواند:**

﴿[١١] إذ يغشيكم النعاس امنة منه﴾ ئەوەشتان لە بیر بێت - كە بەڕۆژێ پێش جەنگەكە - بەخەوە نووچكە لەوكاتی نارحەتیی و ترسەدا هێمنیی و ئاسوودەیی دایگرتن. (عەلی كوڕی ئەبو تالیب) ئەڵێت: لەو ڕۆژەدا هەموو خەومان لێكەوت، پەیامبەری خوا نەبێت ﷺ ئەو لەبن دەرختێكدا هەر نوێژی ئەكردو، هە تا بەیانی لە خزمەت پەروەردگارییدا پاڕایەوەو داوای یارمەتی لێكرد ﴿وينزل عليكم من السماء ماء﴾ بارانیشی لە ئاسمانەوە بۆتان نارد ﴿ليطهركم به﴾ تا لەچڵك وچەپەڵی ڕێگە پاك و خاوێنتان بكاتەوە ﴿ويذهب عنكم رجز الشيطان﴾ و بەد گومانیی وهەموو خەیاڵات و نیازێكی نەگونجاوی شەیتانیشتان لێ وەدوورخات ﴿وليربط على قلوبكم﴾ ودڵنیاتانكات لەسەر یارمەتی خۆی ﴿ويثبت به الأقدام﴾ ولەگۆڕەپانی جیهاددا پێتان مەحكەم و سەقامگیر كا. بەڵێ.. موسڵمانەكان پێش ئەوە بگەنە (بەدر) چڵك و چەپەڵی ڕێگەو، تینوویەتیی و، هەر حاڵەتێكی تری ناهەمواریان تووشببوو، جا خوای گەورە -وەك كەرامەت و ڕێزلێنان بۆیان- ئەو بارانەی بۆ باراندن و، ئەوانیش خۆیانیان پێخاوێن كردەوە. ﴿[١٢] إذ يوحى ربك إلى الملائكة﴾ وەبیرتان بێت كە پەروەردگارت نیگای بۆ فریشتەكان كرد: ﴿انی معكم﴾ كە بچن هاوكارییان بكەن، بە ڕاستیی خۆیشم لەگەڵتانم ﴿فثبتوا الذين آمنوا﴾ و غیرەت وەبەر

بڕوادارەکان بنێن و، موژدەی سەرکەوتنیان بدەنێ و، دڵ ئەستووریان بکەن ﴿سألقي في قلوب الذين كفروا الرعب﴾ بۆخۆیشم زووترس و بیم ئەخەمە دڵی کافرو بێ باوەڕەکانەوە، هەتاهەڵبێن وجەنگییان پێنەکرێت ﴿فاضربوا فوق الأعناق﴾ دەسا ئێوەش-ئەی فریشتەکان !-بە توندی لەملیاندەن ﴿واضربوا منهم كل بنان﴾ وهەموو پەنجەو سەر پەنجەکانیان بپەڕێنن، هەتا لە کار دەکەون و، بە ئاسانی دیل ئەکرێن، ویان ئەکوژرێن، واتە: سەروو دەستیان بپەڕێنن، هەتاجەنگییان پێنەکرێت ﴿[١٣] ذلك بأنهم شاقوا الله ورسوله﴾ ئەوەش چونکە دژایەتی خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن ﴿ومن يشاقق الله ورسوله﴾ هەر کەسیش لەگەڵ خواو پێغەمبەری ئەودا دژایەتی و ململانێ بکا ﴿فإن الله شديد العقاب﴾ بە ڕاستی خوا تۆڵەی زۆر بەهێزە، سەختگیرە ﴿[١٤] ذلكم فذوقوه﴾ دەسا لەدنیادا ئەوسزایە بچێژن ﴿وان للكافرين عذاب النار﴾ بێگومانیشبن لە دوا ڕۆژدا سزای ئاگر بۆکافرەکان ئامادەیە.

**لەبەر زۆری دوژمن هەڵمەیەن:**

﴿[١٥] ياايهاالذين آمنوا﴾ ئەی گەلی خاون باوەڕ! ﴿إذا لقيتم الذين كفروا زحفا﴾ هەر کە لەمەیدانی جەنگدا تووشی بێ باوەڕان بوون و بە زۆری هێرشیان بۆهێنان و کەمکەم لێتان نزیك دەبوونەوە ﴿فلا تولوهم الأدبار﴾ نابێ پشتیان تێ بکەن و، هەڵبێن و ڕابکەن، بەڵکو دەبێ بەرامبەریان خۆ ڕاگربن ﴿[١٦] ومن يولهم يومئذ دبره﴾ هەرکەسێك لە ڕۆژی ڕوو بەڕوو بوونەوەدا پشتیان تێبکات و خۆی بدزێتەوەو شوێنی خۆی چۆڵبکات ﴿إلا متحرفا لقتال﴾ مەگەر بۆ شەڕکردن لە شوێنێکەوە بۆشوێنێکی تر، بە مەبەستی ئەوە جارێکی تر خۆی ساز بداتەوە بۆ هێرش ، ویان بۆئەوەبێت فێڵ لەبێ بڕواکان بکات ، ئەوسا خێرا بگەڕێتەوە سەریان بۆ جەنگ، دیارە لەم حاڵەتانەدا قەیدی نیە ﴿او متحيزا إلى فئة﴾ یان جێگۆڕکێ بکاو خۆی بگەیەنێتە تاقمێکی تری جەنگاوەرەکان ، بۆ ئەوە هەموویێکەوە باشتر جەنگ بکەن، وەك دەڵێ: (الحرب خدعة). ﴿فقد باء بغضب من الله﴾ ئەوە بەدەر لەوحاڵەتانە، خەشم وقینێکی زۆری خوای دەکەوێتە سەر ﴿ومأواه جهنم﴾ وجێ و ڕێیشی دۆزەخ دەبێ ﴿وبئس المصير﴾ ئای دۆزەخیش چارەنووسێکی خراپە.

**خوا خۆی خوانەناسانی کوشت لە بەدردا:**

﴿[١٧] فلم تقتلوهم ولكن الله قتلهم﴾ لەپاش ڕووداوەکەی (بەدر) خەریکبوو هاوەڵان جوامێریی و قارەمانیەتی خۆیانیان باس دەکرد، ئەوجا خوا فەرمووی: لەڕاستیدا ئێوە بێ باوەڕەکانتان نەکوشت لە بەدرا، چونکە شتی وا لە توانای ئێوەدا نەبوو، بەڵکو خوا بۆ خۆی هاوکاریکردن و کوشتنیی و، لەناوی بردن و، ئێوەشی سەرخست ﴿وما رميت إذ رميت ولكن الله رمى﴾ ئەودەمە کە تیرەکانت هاویشت ئەی پێغەمبەر !ﷺ خوا نەناسانتان تێشکان، لەواقیعدا هاوێژەرەکە تۆ نەبووی، چونکە تێشکانی ئەوانە لەتوانای تۆدا نەبوو ئەگەر خوات لەگەڵ نەبووبا، کەوابوو خوای باڵادەست بوو تیرەکانی هاویشت و بەوشێوە ترسی خستە دڵیانەوە، بەتایبەتی ئەو دەمە کەگڵ و زیخەکەت بۆ هەڵدان، چونکە ئەوەندە خۆڵ و زیخ ، کەی شایەنی ئەوەیە سوپایەکی گەورەی ئاوا سەرگەردان وتەفروتوونا بکات. (ئیبن عەبباس) دەڵێت: پەیامبەر ﷺ لامستێك خۆڵی هەڵگرت وبەرەو ڕوخساری موشریکەکان هەڵییدا فەرمووی: ((شاهت الوجوه)) واتە: خوایا! ئەم دەم و چاوانە گشت کوێرو زەرەتاڵ بکەیت! ئینجا هەریەکە لەوانە پارچە زیخ و خۆڵێکی بەرکەوت و لەترسانا پشتیان هەڵکردو تێشکان ﴿وليبلى المؤمنين منه بلاء حسنا﴾ ئەوکارە بۆ ئەوەشبوو کەخوای لەکارزان بڕوادارەکان چاك تاقیبکاتەوە، واتە بەهرەو نیعمەتێکی تری خۆی بەموسڵمانان بناسێنێ، ئەوە بوو ئەو هەموو دەستکەوتە جەنگییەی پێدان و، بێ باوەڕکانیشی تێشکان ﴿إن الله سميع عليم﴾

بێگومان خوا زۆر بیسەرو زنەوایە، بۆ خۆی نزاکەی پەیامبەری ﷺ بیست و وەڵامیشی دایەوە، زانایشە بەدڵسۆزیی و ئیخلاسیان ﴿١٨ ذلكم وأن الله موهن كيد الكافرين﴾ ئەوکارانە بۆئەوەیە بزانن کە: بێگومانە خوای گەورە فرت وفێڵی خوانەناس وکافران ریسواو بێ ئاکام دەکات (زوهری) ئەڵێت: رۆژی بەدر(ئەبوجەهل) وتی: خوایا! هەرکامێکمان ئێمەو تاقمی موحەممەد کاممان خراپەو مافی خزمایەتیی پێشێل کردووە، دەمەوێ ئەمڕۆ لەناوی ببەیت. خوای گەورەش رووی قسەی دەکاتە بێ باوەڕەکان و، بە لاقرتییەوە پێیان ئەڵێت: ﴿١٩ إن تستفتحوا﴾ ئەگەر سەرکەوتنتان دەوێت ﴿فقد جاءكم الفتح﴾ بەڵێ وا یارمەتی خواتان بۆ هات، بەڵام بەشی ئێوەی تێدانەبوو، چونکە ئێوە گوتتان: (اللهم إن كان هذا هو الحق فأمطر علينا حجارة من السماء..) وا بۆتان هات ! ﴿وإن تنتهوا﴾ جا ئەگەر لەجەنگ و دژایەتی پەیامبەریش ﷺ واز بێنن ﴿فهو خير لكم﴾ بۆدنیاو قیامەتتان قازانجتانە ﴿وإن تعودوا نعد﴾ ئەگەر بشگەڕێنەوە سەر جەنگ و، ئاژاوە نانەوە بۆ موسڵمانان ، وائێمەیش تێهەڵدەچینەوەو، وەك رۆژی بەدرتان لێ ئەکەینەوە ﴿ولن تغنى عنكم فئتكم شيئا ولو كثرت﴾ دەستەو کۆمەڵەکەشتان چەندە زۆربێت، لەهیچ سزایەك بێ نیازتان ناکا، وەکو رۆژی بەدر خۆتان دیتان چۆن دەستەو بەستەکەتان تەفرو توونا بوو و هیچ کەڵکی نەبوو بۆتان ﴿وان الله مع المؤمنين﴾ بێگومان خوا لەگەڵ باوەڕداراندایەو، یارمەتییان ئەدا.

**گوێڕاڵی خواو پێغەمبەر بن ﷺ :**

﴿٢٠ يا أيها الذين آمنوا أطيعوا الله ورسوله﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! گوێ بیستی خواو پەیامبەرەکەی بن ﴿ولا تولوا عنه وانتم تسمعون﴾ وپشت لە فەرمانەکانی مەکەن کە: دەشبیسن چیتان بۆباس دەکات ﴿٢١ ولا تكونوا كالذين قالوا سمعنا﴾ وەك ئەو موشریك و بێ باوەڕانە مەبن کە: گوتیان چوو بەگوێمانا! ﴿وهم لايسمعون﴾ کەچی نەچوو بەگوێیانداو کەڵکیان لێ وەرنەگرت !. کۆمەڵێك لەهۆزی (بەنی عبدالدار) گوتیان: ئێمە سەبارەت بەو کتێبە موحەممەد ﷺ هێناویەتی کەڕولاڵین و نابیسین، وە لەگەڵ (ئەبوجەهل)یشدا چوونە بەرەکانی جەنگ، ئەوجا خوا فەرمووی: ﴿٢٢ إن شر الدواب عند الله﴾ بێگومان بێفەڕ ترینی رەوکەرو جوڵندە لای خوا ﴿الصم البكم الذين لا يعقلون﴾ ئەوخەڵکە کەڕو لاڵەیە تێناگات، واتە: بیر لەئایەت و بوونەوەر ناکاتەوەو خۆی گێل دەکا، بێ شك ئەوانە لەهەموو گیانلەبەران پەستترن ﴿٢٣ ولو علم الله فيهم خيرا﴾ خۆ ئەگەر خوا زانیبای خێرێك بەناو چاویانەوەیە ﴿لأسمعهم﴾ کارێکی دەکرد کە: وشەی هەق و ئامۆژگاریەکانی قورئان ببیسن، بەڵام بۆ خۆی دەزانێ کە: خۆماندوکردن لەگەڵیان بێ کەڵکە، وەکو دەفەرموێ:﴿ولو اسمعهم﴾ گریمان پێیشیان ببیسێ ﴿لتولوا وهم

الجزء التاسع — سورة الأنفال

فَلَمْ تَقْتُلُوهُمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ قَتَلَهُمْ ۚ وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ
وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ ۚ وَلِيُبْلِيَ ٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْهُ بَلَآءً حَسَنًا ۚ
إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٧﴾ ذَٰلِكُمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ مُوهِنُ كَيْدِ
ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٨﴾ إِن تَسْتَفْتِحُوا۟ فَقَدْ جَآءَكُمُ ٱلْفَتْحُ ۖ
وَإِن تَنتَهُوا۟ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ وَإِن تَعُودُوا۟ نَعُدْ وَلَن تُغْنِيَ عَنكُمْ
فِئَتُكُمْ شَيْـًٔا وَلَوْ كَثُرَتْ وَأَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا
ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَا تَوَلَّوْا۟ عَنْهُ وَأَنتُمْ
تَسْمَعُونَ ﴿٢٠﴾ وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ قَالُوا۟ سَمِعْنَا وَهُمْ
لَا يَسْمَعُونَ ﴿٢١﴾ ۞ إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلصُّمُّ ٱلْبُكْمُ
ٱلَّذِينَ لَا يَعْقِلُونَ ﴿٢٢﴾ وَلَوْ عَلِمَ ٱللَّهُ فِيهِمْ خَيْرًا لَّأَسْمَعَهُمْ ۖ
وَلَوْ أَسْمَعَهُمْ لَتَوَلَّوا۟ وَّهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٢٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُوا۟ ٱسْتَجِيبُوا۟ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ ۖ
وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَحُولُ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَقَلْبِهِۦ وَأَنَّهُۥٓ إِلَيْهِ
تُحْشَرُونَ ﴿٢٤﴾ وَٱتَّقُوا۟ فِتْنَةً لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟
مِنكُمْ خَآصَّةً ۖ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٢٥﴾

ربع الحزب ١٨

معرضون﴾ ڕوویان وەردەگێڕاو دەرۆیشتن و باوەڕیان نەدەهێنا ، چونکە لە (ئەزەل)دا خوا دەزانیٚ هەرگیز باوەڕ ناهێنن ! کەوابوو تۆش خەریك مەبە لەگەڵیان.

**بە دەنگ خواو پێغەمبەرەوە بچن:**

﴿[٢٤] یا أیها الذین آمنوا استجیبوا لله و للرسول إذا دعاکم لما یحییکم﴾ ئەی گەلی خاوەن باوەڕ! هەرکە خواو پێغەمبەر بانگییان کردن بۆئەنجامدانی ئەوکارەی ئێوە دەژێنێتەوە ، (واتە: گوێڕایەڵی لەقورئان، جیهاد، ڕەوشتی پاك و بەرز...هتد) خێرا وەڵامیان بدەنەوەو فەرمانەکەیان جێبەجێ بکەن ﴿واعلموا ان الله یحول بین المرء وقلبه﴾ چاکیش بزانن کە بێگومان خوا دەتوانیٚ لەنێوان مرۆڤ ودڵییدا لەمپەردانیٚ و، نەهێڵیٚ تووشی هیچ خێروچاکەیەك ببێت ، بۆیە دەبیٚ مرۆڤ هەمیشە لەخوا بترسیٚ و خۆی بداتە دەستی ئەو، هەر لەبەر ئەوەش بوو پەیامبەرمان ﷺ بەردەوام دەیفەرموو: ((یا مقلب القلوب ثبت قلبی علی دینك..)) خوایا! کەئاڵوگۆڕی گشت دڵەکان بەدەستی خۆتە، دەسا دڵم لەسەر دینی خۆت تۆکمە بکە ﴿وانه إلیه تحشرون﴾ ئەمەش براوەتەوە کە هەمووتان لای ئەو کۆ دەکرێنەوەو پاداشت و تۆڵەش وەردەگرنەوە.

**لە بەڵاو فیتنەی گشتگیر خۆ بپارێزن:**

﴿[٢٥] واتقوا فتنة لا تصیبن الذین ظلموا منکم خاصة﴾ لەوفیتنەو بەڵایەش خۆپارێزن و بترسن ، کە کاتیٚ دێت، تەنها ئەوقەی ئەوانەتان نابێت ناهەقییان کردووەو دەستیان تێیدایە، بەڵکو یەخەی هەموان - گوناحبارو، بیٚ گوناح، چاك و خراپ - دەگرێتەوە، یان وەك دەڵێن: (تەڕو وشك) پێکەوە دەسووتیٚ، بۆیە (بوخاری) لە فەرموودەیەکدا هێناویەتی: ((إن الناس إذا رأوا الظالم فلم یأخذوا علی یدیه، أوشك أن یعمهم الله بعذاب من عنده)) واتە: کەخەڵکی ستەمکاریان دیی و، دەستیان نەگرت لەخراپەکەی، نزیکە خوای بە توانا جەزرەبەی هەموان بدات ﴿واعلموا أن الله شدید العقاب﴾ بشزانن کە بێگومان تۆڵەی خوا توندو سەختە (سەدی) دەڵیٚ: ئەم ئایەتە لەکاتی خۆیدا بەتایبەتی بۆ ئاموژگاری (بەدر)یەکان هات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سەدمەخابن لەرووداوەکەی (جەمەل)دا تووشی ئەوهەموو بەڵاو فیتنەیە بوون و لەناوخۆیاندا وەجەنگ هاتن !

**ئەوسا چەن کەم و بیٚ دەسەڵات بوون؟!:**

﴿[٢٦] واذکروا إذ انتم قلیل مستضعفون فی الأرض﴾ ئەوکاتە وەبیر بێننەوە کە ئێوە ئەی موسڵمانان ! لە مەککەدا کەم وکزبوون و لاوازو دەسە پاچەش بوون ﴿تخافون ان یتخطفکم الناس﴾ و دەترسان خەڵك بتانرفێنن و بتانکوژن ﴿فآواکم﴾ لەوکاتەدا خوای میهرەبان پەنایدان و، شاری (مەدینە)ی کردە پەناگاتان ﴿وایدکم بنصره﴾ و لە رۆژەکەی (بەدر)دا یارمەتیدان و پشتگیریی لێکردن و سەریخستن ﴿ورزقکم من الطیبات﴾ و ڕۆزیی پاك وچاکی پێبەخشین، کاروانەکەی کردە دەستکەوتتان ﴿لعلکم تشکرون﴾ گشت ئەمانەی بۆکردن بەشکو شوکرانە بژێرن.

**لە دینی خوا دەغەڵی مەکەن:**

﴿[٢٧] یا أیها الذین آمنوا لا تخونوا الله والرسول وتخونوا أماناتکم﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! گزیی و خیانەت لەخواو لە پێغەمبەرو لە سپاردەکانتان مەکەن، واتە: نەیارو دوژمنی ئەوان مەکەنە یارو دۆستی خۆتان و، نهێنیەکانیان لابدرکێنن ﴿وانتم تعلمون﴾ بۆ خۆیشتان چاك دەزانن کە گوناهو تاوانی خەیانەتکردن چەندە گەورەیەو، دەشگەڕێتەوە سەر ئەستۆی ئێوە. ئەم ئایەتە(وەك شێخی سیووتی) دەڵیٚ سەبارەت بە (ئەبوو لبابە)هاتە خواریٚ، ئەو دەمە کەپەیامبەر ﷺ ناردی بۆ لای (بەنی قورەیزە) لەسەر داوای خۆیان سوڵح و سازشیان لەگەڵکا،

جائەوانیش مەشوڕەتیان پێکردو گوتیان: بە بڕیاری (سەعد) ڕازین، کەچی ئامازەی بە قوڕگی کرد! واتە سەرژێنیان لەگەڵ کەن تیا ئەچن! ﴿[٢٨] واعلموا انما أموالكم وأولادكم فتنة﴾ بشزانن کەبێگومان هەموو ماڵ و سامان و منداڵتان هۆی تاقییکردنەوەن بۆتان، بۆ ئەوەیە دەرکەوێ ئاخۆ ئێوە چۆن هەڵسوکەوتیان لەگەڵ ئەکەن؟ بڵێیت لەبەر ئەوان بەرژەوەندی ئیسلام وەلا نێن؟ ﴿وان الله عنده اجر عظيم﴾ ئاشکرایشە پاداشی زۆرو زەبەنەو فراوان هەرلای خوایە.

(ئەبوو لوبابە) لەنێو (بەنی قوڕەیزە)دا سامان و منداڵەکەی جێمابوو، لەبەر ئەوەبوو ئەو نەرمیەی لەگەڵ نواندن و ئەو (تەصریح)ەیدا ! ﴿[٢٩] یاایها الذین آمنوا إن تتقوا الله﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! ئەگەر لە خوا بترسن و پارێزگاری بڕیارەکانی بکەن ﴿یجعل لكم فرقانا﴾ نوورێکتان دەداتێ بتوانن چاك و خراپی پێ لێك جیاکەنەوەو ڕێتان بۆ ڕوونکاتەوە ﴿ویکفر عنکم سیئاتکم﴾ ولە گوناهەکانی پێشووشتان ببوورێ ﴿ویغفرلکم﴾ و تاوانەکانیشتان ببەخشێ ﴿والله ذو الفضل العظیم﴾ و خواش بۆخۆی خاوەنی بەهرەی زۆر گەورەو مەزنە.

**لەبیرت بێ چ پیلانێکیان بۆ دارشتیت!**

(ئیبن عەبباس) دەڵێت: ئەنجوومەنی قوڕەیش لە(دار الندوە) کۆبوونەوە، بۆ ئەوە دەربارەی پەیامبەر ﷺ نەخشەو پلانێکی ورد دابڕێژن ! جاپاش وتوو وێژێکی زۆرو، شەڕە قسەیەکی نێوانیان، بڕیاریاندا بیکوژن..! (جبریل)یش بە فەرمانی خوا خێرا هەواڵەکەی دابەزاند، ئیتر پەیامبەر ﷺ، خۆی بۆ کۆچکردن ئامادەکرد، ئینجا پاش ئەوە کەگەیشتە (مەدینە) بەوجۆرە کە ژیاننامە دەیگێڕێتەوە خواپیلانەکەی قوڕەیشی بۆگێڕایەوەو فەرمووی: ﴿[٣٠] وإذ یمکر بك الذین كفروا﴾ ئەوکاتە وەبیر بێنە کەبێ باوەڕەکان دەیانویست فێڵت لێ بکەن ﴿لیثبتوك﴾ کە: یا بتگرن و بەندت بکەن ﴿او یقتلوك﴾ یان بتکوژن ﴿او یخرجوك﴾ یان- هەر هیچ نەبێ - لە مەککە دەرت پەڕێنن ﴿ویمکرون ویمکر الله﴾ بەڵێ.. فرت و فێڵی خۆیان دەکەن ، دیارە خوایش پلانی خۆی دادەڕێژێ بۆ پووچەڵکردنەوەی پیلانەکەیان ﴿والله خیر الماکرین﴾ دڵنیاشبن خوا لەهەموو پلاندانەرێك باشترە بۆ پووچەڵکردنەوەی فرت و فێڵی پیلانگێڕان. سەیری (ئیبن هیشام) و (أسباب النزول)ی سیووتی بکە.

**وادەزانن دەتوانن وەك قورئان بڵێن!:**

﴿[٣١] وإذا تتلى علیهم آیاتنا﴾ هەرکە ئایەتەکانمان بۆ قوڕەیش بخوێنرێنەوە ﴿قالوا قد سمعنا﴾ ئەوەندە یاخی وسەرکەشن ئەڵێن: گوێمان لێبوو و بیستمان ﴿لو نشاء لقلنا مثل هذا﴾ خۆ ئەر مەیلمان بێت هەر وەکو ئەمە دەڵێین ﴿إن هذا إلا أساطیر الأولین﴾ ئەمە (موحەممەد) دەیڵێت هەر قسەو ئەفسانەی پێشینانە (نەزری کوڕی حاریس) دەچێتە (حیرە)و هەندێ چیرۆك و داستانی (کیسرا) و (قەیسەر) و(کلیلە) و(دمنە) دەهێنێ، جا کەپێغەمبەر ﷺ

الجزء التاسع — سورة الأنفال

وَٱذۡكُرُوٓاْ إِذۡ أَنتُمۡ قَلِيلٞ مُّسۡتَضۡعَفُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ تَخَافُونَ
أَن يَتَخَطَّفَكُمُ ٱلنَّاسُ فَـَٔاوَىٰكُمۡ وَأَيَّدَكُم بِنَصۡرِهِۦ وَرَزَقَكُم
مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴿٢٦﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ
لَا تَخُونُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ وَتَخُونُوٓاْ أَمَٰنَٰتِكُمۡ وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ
﴿٢٧﴾ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَأَوۡلَٰدُكُمۡ فِتۡنَةٞ وَأَنَّ ٱللَّهَ
عِندَهُۥٓ أَجۡرٌ عَظِيمٞ ﴿٢٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَتَّقُواْ
ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّكُمۡ فُرۡقَانٗا وَيُكَفِّرۡ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَيَغۡفِرۡ
لَكُمۡۗ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٢٩﴾ وَإِذۡ يَمۡكُرُ بِكَ ٱلَّذِينَ
كَفَرُواْ لِيُثۡبِتُوكَ أَوۡ يَقۡتُلُوكَ أَوۡ يُخۡرِجُوكَۚ وَيَمۡكُرُونَ وَيَمۡكُرُ
ٱللَّهُۖ وَٱللَّهُ خَيۡرُ ٱلۡمَٰكِرِينَ ﴿٣٠﴾ وَإِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُنَا
قَالُواْ قَدۡ سَمِعۡنَا لَوۡ نَشَآءُ لَقُلۡنَا مِثۡلَ هَٰذَآ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّآ
أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿٣١﴾ وَإِذۡ قَالُواْ ٱللَّهُمَّ إِن كَانَ هَٰذَا
هُوَ ٱلۡحَقَّ مِنۡ عِندِكَ فَأَمۡطِرۡ عَلَيۡنَا حِجَارَةٗ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ
أَوِ ٱئۡتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٖ ﴿٣٢﴾ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمۡ
وَأَنتَ فِيهِمۡۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ مُعَذِّبَهُمۡ وَهُمۡ يَسۡتَغۡفِرُونَ ﴿٣٣﴾

قورئانی بۆ ئەخوێندەوە دەڵێت: (لو نشاء لقلنا مثل هذا..)! ﴿[٣٢] **وإذ قالوا اللهم إن كان هذا هوالحق من عندك**﴾ وەبیر بێنە ئەودەمە کە قورەیش وتیان: خوایا! ئەگەر ڕاستە ئەم قورئانە هی تۆیە ﴿**فأمطر علينا حجارة من السماء**﴾ لە ئاسمانەوە بەردە بارانمان بکە وەکو قارت لەگەلانی ترگرت ﴿**او إئتنا بعذاب اليم**﴾ وە یان سزایەکی ئێش پێگەیەنەرمان بۆ بێنە، دیارە ئەمە گەمەو لاقرتیی دەکات و، ئەوپەڕ نیشانەی نەفامیی و سەرسەختییانە، ئەگینا دەبوو لەباتی ئەوە داوای بەردەباران بکەن ، لەخوا بپاڕێنەوە ڕێنماییان بکات ، چونکە وەك (ئیبن کەسیر) دەڵێت: دەبوو بیانوتایە (اللهم إن كان هذا هو الحق من عندك فاهدنا له ووفقنا..) نەك داوای بەردە بارانی خۆیان بکەن!! بەڵێ..ئەودەمە کە ئەبوو جەهل وتی:(اللهم إن كان هذا هو الحق..)ئەم ئایەتە هات وفەرمووی: ﴿[٣٣] **وما كان الله ليعذبهم وانت فيهم**﴾ هەتا تۆ لە ناویاندابیت ئەی پێغەمبەر! ناکرێ خوا سزایان بدا، ئەگەرچی بۆخۆشیان داوای بکەن ، چونکە تۆ ڕەحمەت و میهرەبانیی و بەزەییت بۆ هەموان ﴿**وما كان الله معذبهم وهم يستغفرون**﴾ بڕاوەتەوە کە: هەرکەسێك، یان هەر گەلێك - دوای کوفرو هەرتاوانێك - داوای لێبوردن بکات ، ناکرێ خوای دلۆڤان قاری لێ بگرێت، ئەگەرچی خراپیشبن.

وَمَا لَهُمْ أَلَّا يُعَذِّبَهُمُ اللَّهُ وَهُمْ يَصُدُّونَ عَنِ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَمَا كَانُوا أَوْلِيَاءَهُ إِنْ أَوْلِيَاؤُهُ إِلَّا الْمُتَّقُونَ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٤﴾ وَمَا كَانَ صَلَاتُهُمْ عِنْدَ الْبَيْتِ إِلَّا مُكَاءً وَتَصْدِيَةً فَذُوقُوا الْعَذَابَ بِمَا كُنْتُمْ تَكْفُرُونَ ﴿٣٥﴾ إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا يُنْفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ لِيَصُدُّوا عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ فَسَيُنْفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَ وَالَّذِينَ كَفَرُوا إِلَىٰ جَهَنَّمَ يُحْشَرُونَ ﴿٣٦﴾ لِيَمِيزَ اللَّهُ الْخَبِيثَ مِنَ الطَّيِّبِ وَيَجْعَلَ الْخَبِيثَ بَعْضَهُ عَلَىٰ بَعْضٍ فَيَرْكُمَهُ جَمِيعًا فَيَجْعَلَهُ فِي جَهَنَّمَ أُولَٰئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ ﴿٣٧﴾ قُلْ لِلَّذِينَ كَفَرُوا إِنْ يَنْتَهُوا يُغْفَرْ لَهُمْ مَا قَدْ سَلَفَ وَإِنْ يَعُودُوا فَقَدْ مَضَتْ سُنَّتُ الْأَوَّلِينَ ﴿٣٨﴾ وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلَّهِ فَإِنِ انْتَهَوْا فَإِنَّ اللَّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٣٩﴾ وَإِنْ تَوَلَّوْا فَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَوْلَاكُمْ نِعْمَ الْمَوْلَىٰ وَنِعْمَ النَّصِيرُ ﴿٤٠﴾

### دوای کاری خراپ، خوا چۆن جەزرەبەیان نەدا؟

﴿[٣٤] **وما لهم الا يعذبهم الله**﴾ جا بۆ خوا سزای ئەوانەیان نەدا ﴿**وهم يصدون عن المسجد الحرام**﴾ کە ڕێگەی مزگەوتی (حەرام) لە موسڵمانان دەگرن، بەتایبەتی ساڵی ڕووداوەکەی حودەیبیە ﴿**وما كانوا اولياءه**﴾ خۆ ئەوانە خاوەنی مزگەوتی (حەرام) نین، هەتا هەقیان بێت ڕێ بەخەڵکی تر نەدەن ﴿**إن اولياءوه إلا المتقون**﴾ چونکە هەر خۆ پارێزانن هەقی خاوەنێتیان هەیە ﴿**ولكن اكثرهم لايعلمون**﴾ بەڵام زۆربەیان نازانن ، بۆیە سادەو نەزانەکانی قورەیشیش ئەیانوت: ئێمە خاوەن و سەرپەرشتی ماڵی خواین !! بە ئارەزووی خۆمان، کێ مۆڵەت بدەین بۆ زیارەتی کابە، کێش بگێڕینەوە !. (ئیبن عەباس) ئەڵێ: قورەیش بە ڕووت و قووتیی و چەپڵەو فیکەو هەراو هۆسە بەدەوری کابەدا دەسووڕانەوەو تەوافیان دەکرد! جاخوای گەورەش بەوئایەتە ئەونوێژەیانی پووچەڵکردەوەو فەرمووی: ﴿[٣٥] **وما كان صلاتهم عند البيت إلا مكاء وتصدية**﴾ نوێژو پاڕانەوەو لاڵەشیان لەلای (کابە)دا لەڕووی ڕاستیی و گوێ ڕایەڵییەوە نییە، بەڵکو هەرفیکەو چەپڵەو هەراو هۆسەیە ﴿**فذوقوا العذاب بما كنتم تكفرون**﴾ سا لەبەر بێ باوەڕییتان ئەوسزای گرتن و کوشتنە لەبەدردا بچێژن

(المكاء: الصفير، والتصدية: التصفيق).

**خوانەناسان ماڵی خۆیان خەرج دەکەن بۆ بەستنی رێبازی خوا:**

(ئیبن جەریری تەبەری) دەڵێت: ئەو دەمە کە قورەیش لە (بەدر)دا شکان وتیان: خزمینە ! خۆبینیتان (موحەممەد) چی پێکردین ؟! دەسا ئەمڕۆ ڕۆژی هیممەت و غیرەتە.. ڕۆژی هاوکاری وکۆمەکە، بەڵکو تۆڵەی کوژراوەکانمان بکەینەوە. ئیتر ئەم ئایەتە هات وفەرمووی: ﴿[٣٦] إن الذين كفروا﴾ بێگومان ئەوانەی بێ باوەڕن ﴿ينفقون أموالهم ليصدوا عن سبيل الله﴾ ماڵ و سامانی خۆیان بەخت دەکەن بۆ ڕێگرتن لە رێبازی خوا ﴿فسينفقونها﴾ جا بەتەئکید بەردەوام بەختی دەکەن بۆ ئەو مەبەستە ﴿ثم تكون عليهم حسرة﴾ پاشان دەبێتە مایەی ئێش وداخ بۆیان و، پەشیمان ئەبنەوە ﴿ثم يغلبون﴾ سامانەکەیان بەخت دەکەن ، بەڵام بۆ دوایی هەر ژێر ئەکەون و تێ دەشکێن ﴿والذين كفروا إلى جهنم يحشرون﴾ دڵنیابن گشت بێباوەڕان بەرەو دۆزەخ ئەبرێن وکۆ دەکرێنەوە ﴿[٣٧] ليميز الله الخبيث من الطيب﴾ بۆ ئەوە خوای کاردروست پیس و پاك لێك هەڵاوێرێ ، موسڵمان وکافر لێك جیابکاتەوە ﴿ويجعل الخبيث بعضه على بعض﴾ ومرۆڤی پیس و ناپاك ، خوانەناس و بێ دین لەسەر یەك هەڵچنێ ﴿فيركمه جميعا فيجعله في جهنم﴾ جا گشتیان پێکەوە لەدۆزەخدا خڕبکاتەوە ﴿أولئك هم الخاسرون﴾ بێ بەخت و زەرەرمەندی راستەقینە هەر ئەوانەن ﴿[٣٨] قل للذين كفروا﴾ بەبێ باوەڕەکانیان بڵێ: ﴿إن ينتهوا يغفر لهم ما قد سلف﴾ ئێستاش ئەگەر دەست لە بێ دینیی و جەنگ هەڵبگرن و موسڵمان ببن، لە هەرچی ڕابوردویانە چاو پۆشیدەکرێ (لەدەورەی کوفرو خوانەناسییدا هەرشتێکیان کردبێ عەفوە) ﴿وإن يعودوا فقد مضت سنة الأولين﴾ خۆ ئەگەر جارێکیتر تێبچنەوە بۆ سەنگەرو کوشتار، دیارە کەبەسەرهاتی پێشووەکان تێپەڕیوە چۆن بووە بۆ وێرانکردنی وڵات و لەناوبردنی ماڵ و سامانیان، واتە:ئەوان چیان بە سەر هات، بەسەر ئەمانەیش دێت ﴿[٣٩] وقاتلوهم حتى لا تكون فتنة ويكون الدين كله لله﴾ هەتا کوفرو شیرك لەبندێ و، بە هەتا هەتایی کۆتایی دێ و، دینداریی هەر بۆ خوا دەبێ، ئێوەش ئەی موسڵمانان! بەردەوام بەجەنگ بێن لەگەڵیان ﴿فإن انتهوا﴾ جا ئەگەر لەکاری خراپ و درێوو شیرك وکوفر دەسبەرداربوون ﴿فإن الله بما يعملون بصير﴾ ئەوسا هەرچی بکەن خوا پێی بینایە ﴿[٤٠] وإن تولوا فاعلموا أن الله مولاكم﴾ خۆ ئەگەر پشتیان هەڵکردو گوێیان نەگرت، چاك بزانن کە خوا بۆخۆی (مەولا)و پشتیوانتانە ﴿نعم المولى ونعم النصير﴾ خوایش چ گەورەو مەولایەکی چاکە، چ پشتیوان و کۆمەککارێکی باشە!.

لەکۆتاییدا زۆر سوپاسی خوا دەکەم، کەیارمەتیدام بۆ تەواوکردنی جزمی نۆیەم ، لە سوورەتی ئەنفال.

کۆتایی جزمی نۆیەم

ولله الحمد والمنة

*** *** ***

**بەشکردنی (غەنیمەت و فەیئ):**

* لەسەرەتای سوورەتەکەدا فەرمووی :(يسئلونك عن الأنفال..) لەبارەی دەسکەوتەکەی (بەدر)ەوە لێت دەپرسن: ئاخۆ چۆن دابەش دەکرێ و بۆکێ دەبێت؟ جابۆ وەڵامی ئەوپرسیارە خوای لەکارزان فەرمووی: ﴿[٤١] واعلموا أنما غنمتم من شئ﴾ دەبێ بزانن ئەی بڕواداران! کە هەر جۆرە دەستکەوت و غەنیمەتێکتان دەسکەوت لەماڵ و سامانی بێ باوەڕان، زۆر بێ، یان کەم ﴿فأن لله خمسه وللرسول ولذى القربى واليتامى والمساكين وابن السبيل﴾ دە بێ یەك لە پێنجی بۆخواو بۆپەیامبەرو خزمانیی و، بۆ هەتیوان و هەژاران و ڕێبواران بێت، واتە:

دەستکەوتی جەنگی ئەکریٚ بە پێنج بە شەوە: بەشێکی بۆ ئەوانەیەو، چوار بەشەکەی تریشی بەم شێوەیە بەسەر جەنگاوەرەکاندا بەشدەکرێت: بەشی یەکەمی بۆ خواو بۆ پەیامبەر دادەنرێت، واتە: ئەم بەشە دەدریٚ بەوانە کە لە رێگای خوادا تێدەکۆشن و، لە سنوورەکانی ولاّتی ئیسلامییدا ئەمێننەوەو، خەریکی خۆ ئامادەکردنن بۆ جیهادو، چاودێری ولاّت و نیشتمان دەکەن و، لە کافران دەیپارێزن، هەروا بۆ هەرشتێکی تر کە بەرژەوەندیی و، خزمەتی ئیسلامی تێدا بێت سەرف دەکرێت. دیاریکردنی ئەندازەی بەشەکانی تریش حەواڵەی خەلیفەو ئەمیری ئەوکاتە دەکریٚ، ئەو چۆنی بەلاوە باشبوو، وا دابەشی دەکات ﴿إن كنتم آمنتم بالله وماأنزلنا على عبدنا يوم الفرقان﴾ ئەگەر باوەڕتان بە خواو بەوبەرنامەیە هەیە ناردوومانە بۆ عەبدو بەندەی خۆمان موحەممەد ﷺ لەڕۆژی جیاکردنەوەی ڕاست و ناڕاست دا، واتە: لە ڕۆژەکەی بەدردا ﴿يوم التقى الجمعان﴾ ڕۆژی بە یەکگەیشتنی هەردوو دەستەکە، دەستەی بڕواداران و، دەستەی بیٚ دین و بێباوەڕان ﴿والله على كل شئ قدير﴾ خوا توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، ویستی لە هەرشتێك بوو بیکا، دەیکات ، لەو ڕۆژەدا ویستی موسڵمانەکان سەرخات " ئەگەر چی ژمارەو چەکیشیان کەم بوو" سەریخستن، موسڵمانەکان (٣١٣) کەسبوون، کافرەکانیش نزیکەی (١٠٠٠) کەسبوون، بەفەرمانی خوا توانییان (٧٠) کەسیان لێبکوژن و، (٧٠)شیان لێدیل بکەن.

وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا غَنِمۡتُم مِّن شَيۡءٖ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ وَلِلرَّسُولِ
وَلِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ إِن
كُنتُمۡ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ وَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَىٰ عَبۡدِنَا يَوۡمَ ٱلۡفُرۡقَانِ
يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ٤١ إِذۡ
أَنتُم بِٱلۡعُدۡوَةِ ٱلدُّنۡيَا وَهُم بِٱلۡعُدۡوَةِ ٱلۡقُصۡوَىٰ وَٱلرَّكۡبُ
أَسۡفَلَ مِنكُمۡۚ وَلَوۡ تَوَاعَدتُّمۡ لَٱخۡتَلَفۡتُمۡ فِي ٱلۡمِيعَٰدِ
وَلَٰكِن لِّيَقۡضِيَ ٱللَّهُ أَمۡرٗا كَانَ مَفۡعُولٗا لِّيَهۡلِكَ مَنۡ
هَلَكَ عَنۢ بَيِّنَةٖ وَيَحۡيَىٰ مَنۡ حَيَّ عَنۢ بَيِّنَةٖۗ وَإِنَّ ٱللَّهَ
لَسَمِيعٌ عَلِيمٌ ٤٢ إِذۡ يُرِيكَهُمُ ٱللَّهُ فِي مَنَامِكَ قَلِيلٗاۖ
وَلَوۡ أَرَىٰكَهُمۡ كَثِيرٗا لَّفَشِلۡتُمۡ وَلَتَنَٰزَعۡتُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِ
وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ سَلَّمَۚ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ٤٣ وَإِذۡ
يُرِيكُمُوهُمۡ إِذِ ٱلۡتَقَيۡتُمۡ فِيٓ أَعۡيُنِكُمۡ قَلِيلٗا وَيُقَلِّلُكُمۡ
فِيٓ أَعۡيُنِهِمۡ لِيَقۡضِيَ ٱللَّهُ أَمۡرٗا كَانَ مَفۡعُولٗاۗ وَإِلَى ٱللَّهِ
تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ ٤٤ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمۡ فِئَةٗ
فَٱثۡبُتُواْ وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرٗا لَّعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ٤٥

سُورَةُ الأَنفَال — الجزء العاشر — ١٨٢ — وأطيعوا الله

**ڕوونکردنەوەیەك:** هەرشتیٚ بەشەڕو جەنگ دەستبکەوێت، پێی دەڵێن (غەنیمەت)، هەرچیش بیٚ جەنگ و هەرا دەسکەوت وەکو "ماڵی سەرانەو، خەراج و، ماڵی بیٚ میراتگرو هەروەها.." پێیدەڵێن: (فەیئ) ئەگەرچی هەندیٚ لە زاناکان دەڵێن: هەردوو وەك یەکن. (ئیبن تەیمییە) دەڵیٚ: ئەمانە هەردوو دەدرێنە دەستی ئەمیرو پێشەوا، چۆنی بەچاکزانی، وا بەشی دەکا، تەنانەتی "جیا لەبەشی خۆی" شتێکی بۆ هەڵدەبژێردریٚ، وەکو لەڕۆژی (بەدر)دا شیری (زوڵفەقار) درایە پێغەمبەر ﷺ.

**خوا موسڵمانەکانی لەبەدردا سەرخست:**

﴿[٤٢] إذ انتم بالعدوة الدنيا﴾ ئەو ڕۆژەتان وەبیربێت ئەی بڕوادارەکان! کە لەگەڵ بیٚ باوەڕەکاندا بە یەك گەیشتن، ئێوە لە داوێنەی نزیکتر بوون (لە خوارووی شیوەکەدا) و نزیك بە مەدینە ﴿وهم بالعدوة القصوى﴾ وئەوانیش "بیٚ باوەڕەکان" لە داوێنەی دوورو، لای سەرووی مەدینەدا دامەزرا بوون ﴿والركب أسفل منكم﴾ کاروانەکەش لە خوارتری ئێوەوە بوو بە چوار کیلۆمەتر ونیو بەرەو دەریاو دەستیان پێنەدەگەیی ﴿ولو تواعدتم لاختلفتم فى الميعاد﴾ وەئەر ژوان و(مەوعید)تان بۆ جەنگەکە دانابا، ئەوا ئێوە لەسەر کاتەکە ناکۆك دەبوون دوادەکەوتن ، واتە: وا بەئاسانی ڕێك نەدەکەوتن و لەبەرکەمی ئێوەو، زۆری ئەوان جەنگەکەتان نەدەکرد، وەك ئێستا نەدەبوو کە کتوپڕ

ڕوو بەڕوو وەستان و سەرکەوتن ﴿ولكن ليقضى الله أمرا كان مفعولا﴾ بەڵام بێ خۆ ئامادەکردن چوونە جەنگەکەوە، بۆئەوەی بڕیارێك لای خوا بڕاوەتەوە (سەرخستنی ئیسلام و موسڵمانان و، تێشکانی دوژمنان وکافران) بێتەدی ﴿ليهلك من هلك عن بينة ويحيى من حى عن بينة﴾ و تائەوەی دەبێ بمرێ و تیا بچێ و، ئەوەش بڕیارە بژێ و زیندەبێ با هەردوولا بەبەڵگەی ئاشکرابێ، واتە: کێ موسڵمان دەبێت، با لە سەربەڵگە موسڵمان بێت، کێش کافرو خوانەناس دەبێت، بائەویش پاش بەڵگە بێت. ﴿وإن الله لسميع عليم﴾ بێگومان خوا وتەکانتانی دەبیست کە: چۆن دەپاڕێنەوە، بە کردەوەکانیشتاندا دەزانێ شیاوی سەرخستنن، بۆیە لە بەدردا سەریخستن.

## خوا کافرو موسڵمانی بەکەم ئامار هێنایە بەرچاو یەك:



وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَا تَنَٰزَعُوا فَتَفْشَلُوا وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ
وَاصْبِرُوٓا إِنَّ اللَّهَ مَعَ الصَّٰبِرِينَ ﴿٤٦﴾ وَلَا تَكُونُوا كَالَّذِينَ
خَرَجُوا مِن دِيَٰرِهِم بَطَرًا وَرِئَآءَ النَّاسِ وَيَصُدُّونَ
عَن سَبِيلِ اللَّهِ وَاللَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطٌ ﴿٤٧﴾ وَإِذْ زَيَّنَ لَهُمُ
الشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ وَقَالَ لَا غَالِبَ لَكُمُ الْيَوْمَ مِنَ
النَّاسِ وَإِنِّي جَارٌ لَّكُمْ فَلَمَّا تَرَآءَتِ الْفِئَتَانِ نَكَصَ
عَلَىٰ عَقِبَيْهِ وَقَالَ إِنِّي بَرِيٓءٌ مِّنكُمْ إِنِّيٓ أَرَىٰ مَا لَا تَرَوْنَ
إِنِّيٓ أَخَافُ اللَّهَ وَاللَّهُ شَدِيدُ الْعِقَابِ ﴿٤٨﴾ إِذْ يَقُولُ
الْمُنَٰفِقُونَ وَالَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ غَرَّ هَٰٓؤُلَآءِ دِينُهُمْ
وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَإِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٤٩﴾
وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ يَتَوَفَّى الَّذِينَ كَفَرُوا الْمَلَٰٓئِكَةُ يَضْرِبُونَ
وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَٰرَهُمْ وَذُوقُوا عَذَابَ الْحَرِيقِ ﴿٥٠﴾ ذَٰلِكَ
بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيكُمْ وَأَنَّ اللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿٥١﴾
كَدَأْبِ ءَالِ فِرْعَوْنَ وَالَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ كَفَرُوا بِـَٔايَٰتِ اللَّهِ
فَأَخَذَهُمُ اللَّهُ بِذُنُوبِهِمْ إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ شَدِيدُ الْعِقَابِ ﴿٥٢﴾



﴿[43] إذ يريكهم الله فى منامك قليلا﴾ ئەوەش وەبیر بێنە کە: خوا لە خەونتدا ژمارەی دوژمنانتی بەکەم و بێ بایەخ نیشاندایت، هەتا هاوەڵانتی لێ ئاگادار بکەیت و، ئەوانیش دڵقایم بن بەیارمەتی خوا. (موجاهید) ئەڵێ: خوای گەورە ئەوانی لەخەودا بەکەم نیشانی پەیامبەردا ﷺ، جائەویش بۆ هاوەڵانی گێڕایەوە، دەرەنجام بەسەرکەوتن دڵنیابوون و سەریشکەوتن ﴿ولو اراكهم كثيرا﴾ ئەگەر ئەوانی بەزۆر نیشاندابایت ﴿لفشلتم﴾ لێیان ئەترسان و سست دەبوون ﴿ولتنازعتم فى الأمر﴾ و لەناو خۆتانیشدا ناکۆك وپەرت دەبوون ﴿ولكن الله سلم﴾ بەڵام خوا لەوە پاراستنیی و، نەیهێشت تووشی ئەوە ببن ﴿إنه عليم بذات الصدور﴾ چونکە بێگومانە بەوەی لەدڵ و دەروونداپە زاناو بەئاگایە ﴿[44] وإذ يريكموهم إذا التقيتم فى اعينكم قليلا﴾ ئەی لەبیرتانە کە: لەکاتی بەیەکگەیشتنندا لەگۆڕەپانی جەنگدا بەکەم نیشانیدان لەبەر چاوتاندا، هەتا لێیان سڵ نەکەنەوەو بەدڵنیاییەوە بۆیان بچنە پێشێ ﴿ويقللكم فى اعينهم﴾ و ئێوەشی لەبەرچاوی ئەواندا بەکەم نیشاندا ﴿ليقضى الله أمرا كان مفعولا﴾ هەتا ئەوی بڕیاری لە سەرداوە جێبەجێی کا، وەك سەرخستنی موسڵمانان ﴿وإلى الله ترجع الأمور﴾ کارەکانیش هەموو هەر بۆلای خوای دانا دەبرێنەوە.

## هێندێ نەخشەو پلانی جەنگ:

﴿[45] يا ايها الذين آمنوا إذا لقيتم فئة﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! کاتێ لەگەڵ دەستەیەك لە دوژمنان بەیەك دەگەن لەجەنگدا ﴿فاثبتوا﴾ بەرامبەریان مەحکەم و دامەرزاوبن و هەرگیز هەڵ نەیەن ﴿واذكروا الله كثيرا﴾ وە یادی خوا زۆر بکەن ﴿لعلكم تفلحون﴾ بەشکو سەرفرازبن و سەرکەون ﴿[46] واطيعوا الله ورسوله﴾ وەگوێ ڕایەڵیی لە فەرمانەکانی خواو پەیامبەری ئەو بکەن ﴿ولا تنازعوا فتفشلوا وتذهب ريحكم﴾ وقرە قرو کێشەش لەگەڵ یەکتردا

مەکەن، هەتا هێزو تواناتان بچێ و، ئەوساش کزو لاوازو سست ببن ﴿واصبروا إن الله مع الصابرين﴾ ئارامتان بێت- کاتێ بەدوژمن گەیشتن – چونکە دڵنیابن خوا لەگەڵ ئارامگرانداية.

**کەش و فشی قورەیش ئەودەمە چوونە بەدر:**

﴿٤٧ ولا تكونوا كالذين خرجوا من ديارهم بطرا ورئاء الناس﴾ ئێوە وەکو ئەوانە مەبن کە لەبەر ڕووپامایی بۆخەڵك لەماڵەوە دەرچوون و، فشەو کەشخەیان دەکرد، مەبەست لەو یاخیانە کافرەکانی قوریشە، چونکە ئەودەمە کە دەرچوون بۆ بەدر (ئەبوجەهل) وتی: سوێند بە خوا هەتا نەچینە (بەدر)و عەرەقی تیانەخۆینەوەو، وشتر سەرنەبڕین و، کیژۆڵەو کەنیزە گۆرانیمان بۆ نەڵێن و، هەموو عەرەب پێ نەزانن-هەتا لێمان بترسن- ناگەڕێینەوە ! ﴿ويصدون عن سبيل الله﴾ وڕێی خوایش لەخەڵك دەبەستن ﴿والله بما يعملون محيط﴾ و خۆ خواش بە هەموو کارێکی ئەوان زاناو ئاگایەو، گەمارۆیداون، ئیتر چی دەکەن وچی دەڵێن بۆخۆیان ئازادن ﴿٤٨ وإذ زين لهم الشيطان أعمالهم﴾ شەیتان ئاکاری ناپەسەندی ئەوکاتەی ئەوانی لاجوانکردن، هەتا بچن لەگەڵ پەیامبەردا ﷺ بجەنگێن ﴿وقال لا غالب لكم اليوم من الناس﴾ وفریویدان و پێیگوتن: ئەمڕۆ کەسێك نیە لەناو خەڵکدا بتوانێ بەسەر ئێوەدا زاڵ ببێ ﴿وإني جار لكم﴾ و منیش بۆخۆم هاوکارو پشتیوانتانم ﴿فلما تراءت الفئتان﴾ جاکە هەردوو کۆمەڵەکە یەکتریان دیت و ڕوو بە ڕوو بوونەوەو، ڕۆژی خۆی هات ﴿نكص على عقبيه﴾ شەیتان پاشەو پاش دزەی بۆکردو هەڵهات ﴿وقال إني بريء منكم﴾ وتی: بێسۆ من لەگەڵ ئێوە نیم و بەریيم لێتان ﴿إني أرى ما لاترون﴾ چونکە ئەوی من دەیبینم و دەیزانم ، ئێوە نایزانن و نایبینن، من دەبینم بەئاشکرا فریشتە دێنە خوارێ و هاوکاری ئەولا دەکەن ﴿إني أخاف الله﴾ چاك بزانن من لە سزای خوا دەترسم و لەگەڵ ئێوە نیم ﴿والله شديد العقاب﴾ سزاو تۆڵەی خواش زۆر سەختە بۆ تاوانباران ﴿٤٩ إذ يقول المنافقون﴾ وەبیر بێنە کە دوو ڕووەکان ﴿والذين في قلوبهم مرض﴾ وئەوانەی لە دڵیاندا نەخۆشیی و بەدگومانی هەبوو دەیانگوت: ﴿غر هؤلاء دينهم﴾ ئەوانە-واتە: موسڵمانەکان بەقسەی ئەوان- بە ئایینەکەیان خەڵەتاون و چەواشە بوون، بۆیە خۆیان ناوە بەم جەنگەوە! ئەگینە بەو ژمارە کەمەوە چۆن جەنگ دەکرێت؟ خواش فەرمووی:﴿ومن يتوكل على الله﴾ با ئەوانە هەر قسە بکەن، چونکە هەرکەسێك پشت بەخوای گەورە ببەستێ، خوا یارمەتی دەدات ﴿فإن الله عزيز حكيم﴾ چونکە بێگومانە کەئەو خوایە زۆر دەستەڵاتدارو بەتوانایە، کاردروست و کارجوانە، هەموو شتێکی پڕ لەحیکمەتە ﴿٥٠ ولو ترى إذ يتوفى الذين كفروا الملائكة﴾ ئەر لە سەرە مەرگدا بێ باوەڕان ببینی کە: چۆن فریشتەکان گیانیان ئەکێشن، ئەوا شتێکی سەر سوڕهێنەر ئەبینی ﴿يضربون وجوههم وأدبارهم﴾ دەبینی لەو حاڵەتەدا دەم و چاوو پشتیان دەکوتن ﴿وذوقوا عذاب الحريق﴾ و پێشیان دەڵێن: دەسا سزای سووتێنەری دۆزەخ بچێژن ﴿٥١ ذلك بما قدمت أيديكم﴾ ئەو سزاو لێدانەش لەبەر ئەوکارە خراپانەیە لە پێشەوە دەتانکرد ﴿وأن الله ليس بظلام للعبيد﴾ و بێگومانیشبن هەرگیز خوا غەدر لە بەندەکانی خۆی ناکاو، بە ناهەق و نارەوا سزای هیچ کەسێك نادات ﴿٥٢ كدأب آل فرعون﴾ شێوەی تاوانکاریی ئەمانەیش دەڵێیت بەدکاری فیرعەون و نزیکەکانی فیرعەونە ﴿والذين من قبلهم﴾ و ئەوانەش کە لە پێشیانەوە بوون، وەکو گەلی نوح و هودو.. هتد ﴿كفروا بآيات الله﴾ حاشایان لەئایەتەکانی خواکرد ﴿فأخذهم الله بذنوبهم﴾ خوایش بە هۆی گوناح و تاوانەکانیانەوە قاری لێگرتن ﴿إن الله قوي شديد العقاب﴾ ئاشکرایشە کەخوا زۆر بەهێزە، تۆڵەی زۆر سەختە ﴿٥٣ ذلك بأن الله لم يك مغيرا نعمة أنعمها على قوم﴾ ئەو سزایەش لەبەر ئەوە تووشیان بوو، چونکە: خوای گەورە هەر بەهرەو بەخششێکی بەهەرگەلێك دابێ، لێی نەگۆڕیوەو، لێی تێك نەداوە ﴿حتى يغيروا ما

﴿بأنفسهم﴾ هەتا ئەوان بیری خۆیانیان نەگۆڕیبێ، واتە: مەگەر ئەوحەلە بێ بڕواو سپڵە دەرچووبن، ئەوسا ئەویش
قاری لێگرتوون، خوای میهرەبان پێغەمبەری بۆناردن باوەڕیان پێنەکرد، ئەویش جەزرەبەیدان ﴿وأن الله سميع
عليم﴾ بەڕاستی خوا زۆر بیسندەیە، زۆر زانایە، دەزانێ چی دەکەن و چی دەڵێن، پاشان بەپێی ئەوە سزاو تۆڵە
دەدا ﴿٥٤ كداب آل فرعون والذين من قبلهم﴾ ئەوانە بەدەردی داروەدەستەکەی فیرعەون و، ئەوانەی لە پێشیانەوە
بوون (هوودو لوط..) چوون ﴿كذبوا بآيات ربهم﴾ چونکە باوەڕیان بە ئایەتەکانی پەروەردگاریان نەکرد ﴿فأهلكناهم
بذنوبهم﴾ ئینجا ئێمەیش بە هۆی گوناهەکانیانەوە لەناومان بردن ﴿واغرقنا آل فرعون﴾ هەرچی سەربە فیرعەونیش
بوون لەدەریادا خنکانمانن و نقوممان کردن ﴿وكل كانوا ظالمين﴾ کە هەموویان ستەمکار بوون و باوەڕیان
بەیەکخواپەرستیی نەبوو ﴿٥٥ إن شر الدواب عند الله﴾
بێگومان خراپترین ڕەوکەرو جوڵندە بەلای خواوە ﴿الذين
كفروا فهم لا يؤمنون﴾ ئەوانەن بێ باوەڕن و، باوەڕ ناهێنن
﴿٥٦ الذين عاهدت منهم﴾ ئەوانەی پەیمانت لەگەڵ بەستن
﴿ثم ينقضون عهدهم في كل مرة﴾ پاشان جار لەدوای جار
پەیمانەکەیان هەڵدەوەشێننەوە ﴿وهم لايتقون﴾ و هەرگیز
لەشەڕو ئاژاوەش خۆ لانادەن، مەبەست لەو پەیمان شکێنانە
جوولەکەی (بەنی قوڕەیزە)یە، چونکە ئەوانبوون کە
پەیامبەر ﷺ پەیمانی لەگەڵ بەستن بۆ ئەوە هاوکاریی
موشریکەکان نەکەن ، کەچی پەیمانەکەیان شکاندو لەڕۆژی
بەدردا هاوکاری وهاوبەشیی قوڕەیشیان کرد ! پاشانوتیان
پەیمانەکەمان لە بیرچووە، بەڵام وانەبوو، چونکە
چەندجارێك پەیمانیانداو هەرئاوا شکاندیان !!

### کافران تەمێ بکەن:

﴿٥٧ فإما تثقفنهم في الحرب﴾ ئینجا ئەگەر لە جەنگدا
زاڵبوویت بەسەریاندا ﴿فشرد بهم من خلفهم﴾ وایان لێ بکە
بائەوانەی لە پشتیانەوەن پەرت و بڵاوبن و پەندو عیبرەت
وەرگرن ﴿لعلهم يذكرون﴾ بەشکو بیر بکەنەوەو دەست لە خیانەت هەڵگرن، واتە: بەڵکو ئەوانە ببنە پەند بۆ خەڵکانی
تریش، تا جارێکی تر نە ئەوان و نە خەڵکانی تر، بیر لە جەنگ وئاژاوە نەکەنەوە لەگەڵتان.

### سوێن و پەیمانیان بە ئاشکرا بدە دواوە :

﴿٥٨ وإماتخافن من قوم خيانة﴾ گەر ترست لە هەرهۆزێ (وەکو بەنی نەزیرو، بەنی قورەیزە) هەبوو: گزییت لێ
بکەن و پەیمان بشکێنن ﴿فانبذ إليهم على سواء﴾ جا تۆیش بە ئاشکرا سوێندو پەیمانەکەیان بەسەرا بدەوە، تا
بەرامبەر یەك دەبن، واتە: با هەردوولا بزانن کە ئیتر پەیمان لە نێواندا نەماوەو هەوڵی حاڵەتێکی تر بدەن ﴿إن الله لا
يحب الخائنين﴾ بە ڕاستیی خوا گزیکارانی خۆشناوێت، ئەوانەی ماناو ڕێزی پەیمان نازانن و، فێڵ لەیەکدی
دەکەن. پێشەوا (ئەحمەد/ خوا لێی رازی بێت) دەڵێ: لەنێوان (ڕۆم)ـەکان و (موعاوییە)دا پەیمانێك مۆر کرابوو و،



ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ لَمْ يَكُ مُغَيِّرًا نِّعْمَةً أَنْعَمَهَا عَلَىٰ قَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا۟
مَا بِأَنفُسِهِمْ ۙ وَأَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٥٣﴾ كَدَأْبِ ءَالِ
فِرْعَوْنَ ۙ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِ رَبِّهِمْ فَأَهْلَكْنَـٰهُم
بِذُنُوبِهِمْ وَأَغْرَقْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ ۚ وَكُلٌّ كَانُوا۟ ظَـٰلِمِينَ ﴿٥٤﴾
إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٥٥﴾
ٱلَّذِينَ عَـٰهَدتَّ مِنْهُمْ ثُمَّ يَنقُضُونَ عَهْدَهُمْ فِى كُلِّ مَرَّةٍ
وَهُمْ لَا يَتَّقُونَ ﴿٥٦﴾ فَإِمَّا تَثْقَفَنَّهُمْ فِى ٱلْحَرْبِ فَشَرِّدْ بِهِم
مَّنْ خَلْفَهُمْ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿٥٧﴾ وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِن
قَوْمٍ خِيَانَةً فَٱنۢبِذْ إِلَيْهِمْ عَلَىٰ سَوَآءٍ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْخَآئِنِينَ
﴿٥٨﴾ وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ سَبَقُوٓا۟ ۚ إِنَّهُمْ لَا يُعْجِزُونَ ﴿٥٩﴾
وَأَعِدُّوا۟ لَهُم مَّا ٱسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ ٱلْخَيْلِ
تُرْهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ وَءَاخَرِينَ مِن دُونِهِمْ
لَا تَعْلَمُونَهُمُ ٱللَّهُ يَعْلَمُهُمْ ۚ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِن شَىْءٍ فِى سَبِيلِ
حزب ١٩ ٱللَّهِ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لَا تُظْلَمُونَ ﴿٦٠﴾ ۞ وَإِن جَنَحُوا۟
لِلسَّلْمِ فَٱجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٦١﴾

لەلای ئەوانەوە بەرەو هەڵوەشانەوە دەچوو، بۆیە (موعاوییە) ویستی لەناوچەکەیاندا بمێنێتەوە هەتا ماوەی پەیمانەکەی کۆتایی دێ و، بەخۆیان نەزانن پەلاماریان بدا ! (عەمری کوری عەبەسە)ی پێگەیشت و گوتی: (الله أکبر، الله اکبر)! چۆن وادەبێ، مەگەر تۆ پەیمانت لە گەڵیاندا نیە ؟واتە: دەبێ ماوەی ئەوپەیمانەت تەواوبکەیت، چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: هەرکەسێك پەیمانێکی هەبێ، نابێ دەسکاری بکا هەتا ماوەکەی تەواو دەبێ، یان ئاگادار دەکرێ، پاشان (موعاوییە) ناوچەکەی بەجێهێشت. ﴿[٥٩] ولا یحسبن الذین کفروا سبقوا﴾ بائەو بێ باوەڕانە -کەلە(بەدر) دەرچوون و نەکوژران - وابیر نەکەنەوە کە: ئیتر لەمردن رزگاربوون ﴿إنهم لا یعجزون﴾ بێگومانبن لەدەست دەرنەچوون و، هەرگیزیش ئیمە دەستەوسان ناکەن و، جارێکی تریش هەر دەشکێنرێن.

**ئێوەش باش خۆتان ئامادەی جەنگ بکەن:**

﴿[٦٠] واعدوا لهم ما استطعتم من قوة ومن رباط الخیل﴾ هەتا بۆتان دەکرێ و لە تواناو وزەتاندایە چەك و جبەخانەی جەنگ و، ئەسپی چابوکی سواریی- دژی دوژمنانی دینی خوا - ئامادە بکەن ئەی باوەڕداران !- واتە: بەپێی ئەوکات و سەردەمە تێیدان چەك وفڕۆکەو تانك و ڕۆکێت و هەمو جۆرە پێویستیەك ڕێك بخەن ﴿ترهبون به عدوالله وعدوکم﴾ دوژمنی خواو، دوژمنی خۆتانی پێ بترسێنن ،چونکە ئەر بزانن توانای جەنگتان هەیە ناتوانن شەڕتان پێبفرۆشن ﴿وآخرین من دونهم لا تعلمونهم﴾ بێ لەوانیش ئەودوژمنانەش بترسێنن ئێوە نایانناسن ﴿الله یعلمهم﴾ هەرخوا چاك ئەیانناسێ ﴿وما تنفقوا من شئ فی سبیل الله﴾ هەرشتێکیش لەڕێگەی خوادا ببەخشن ﴿یوف إلیکم﴾ بەکامڵی خوا دەیبژێرێ بۆتان و پاداشتی وەردەگرن ﴿وانتم لا تظلمون﴾ و بە هیچ شێوەیەکیش ستەمتان لێ ناکرێ. پێغەمبەر ﷺ لەسەر میمبەرەکەی خۆیەوە فەرمووی: ((وأعدوا لهم ما استطعتم من قوة، الا إن القوة الرمی، الا إن القوة الرمی))، واتە: خەڵکینە! چاك بزانن ئەو(هێزە) خوایگەورە لەئایەتەکەدا داوا لە موسڵمانان دەکا ئامادەی بکەن تیر هاویشتنە، دەسا ئێوەش خۆ ئامادە بکەن. پێشەواموسلیم.

**ئەر ئاگر بەسیان راگەیان، تۆش قەبووڵی بکە:**

﴿[٦١] وإن جنحوا للسلم فاجنح لها﴾ ئەگەر دوژمنانی دینی خوا مەیلی ئاشتەوایی و ئاگربەسیان کردو ملیان ڕاکێشا بۆی، تۆیش ئەی پێغەمبەر ! دەتوانی قبوڵی بکەیت و، وەڵامیان بدەیتەوە، بەمەرجێ بەرژەوەندیی و، سەروەریی و سەربەرزیی موسڵمانانی تێدا بپارێزرێ ، ئەگینا هەموو جۆرە ئاشتیی و سازشێك حەرام و یاساغە، خوا لەجێگایەکی تردا لەو بارەیەوە ئەفەرموێ:(فلا تهنوا وتدعوا إلی المسلم وانتم الأعلون) ٣٥/٤٠. (قەتادە) ئەڵێ: ئەم فەرمانی ئاگربەس و ئاشتیە، پێشی فەرمان بە جیهادو، پێش ئایەتی: (قاتلوا الذین لا یؤمنون بالله ولا بالیوم الآخر)٩/٢٩بووە، واتە ئەو ئاگر بەسە (نەسخ) بۆتەوەو، هەردەبێ جەنگیان لەگەڵ بکرێت ﴿وتوکل علی الله﴾ و هەر بەخوایش پشت ببەستە ﴿إنه هوالسمیع العلیم﴾ چونکە تەنها خۆیەتی بیسندە، زانا، ئاگادار بەهەموو شتێك ، پەیمانەکەی پێغەمبەریش ﷺ لەحودەیبییەدا لەسەر بەرچاوگرتنی ئەم بنەماو خاڵانەبوو بۆ ئاییندەی موسڵمانان ، بۆیە ئاگربەستەکەی بۆ ماوەی (٩) ساڵ قەبووڵکرد ﴿[٦٢] وإن یریدوا أن یخدعوك﴾ وئەگەر ویستیان بەو ئاگربەس وسازشە فێڵت لێ بکەن ﴿فإن حسبك الله﴾ جا بێگومان تۆ تەنها خوات بەسە ﴿هو الذی أیدك بنصره وبالمؤمنین﴾ هەر ئەو خوایەش بوو کە لەڕۆژی بەدرا بە کۆمەکی خۆیی و، بە دڵسۆزی باوەڕداران پشتیوانی کردیت ﴿[٦٣] والف بین قلوبهم﴾ وهۆگریی و تەبایی خستە دڵ و دەرونیانەوە، مەبەست لە موسڵمانانی هۆزی (ئەوس) و (خەزرەج)ـە، ئەوانبوون پاش ئەو هەموو کێشەو دوژمنایەتییە مێژووییەی سەردەمی نەفامییان-بەفەزڵی ئیسلام-

ئاشتبوونەوەو بوونە برا ﴿لو انفقت ما فی الأرض جمیعا﴾ ئەگەر هەرچی لەم زەوییەدایە بەختت کردبا لەپێناوی ئەوئاشتەواییەدا ﴿ماالفت بین قلوبهم﴾ نەدەتوانی دۆستی وتەبایی ئاوا لەدڵیاندا جێگیر بکەیت لە نێوان دڵەکانیاندا ﴿ولکن الله الف بینهم﴾ بەڵام خوای دلۆڤان - بە میهرەبانیی و توانایی خۆی - ئاشتیکردنەوەو هۆگری خستە نێوانیان ﴿إنه عزیز حیکم﴾ بێگومان ئەوخۆی دەسەڵاتداری لەکارزان و کارجوانە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ گەلێ جار ئەو نیعمەتەی برایەتیەی وەبیر دەهێنانەوە، بەتایبەتی لە (حونەین)دا فەرمووی: مەگەر ئێوە رێتان ون نەکردبوو، خوا بەهۆی منەوە رێگەی نیشاندان، هەژارو دەست کورت نەبوون، بەبۆنەی منەوە خوا ژیاندنیەوە، پەرت و سەرلێشێواو نەبوون، خواهۆگری خستە نێوانتانەوە، هەموو جار دەیانگوت:( بەڵێ) وە سوپاسی خواو پێغەمبەریان دەکەرد،
منەتیان هەڵدەگرت (متفق علیه).
﴿٦٤ یاایها النبی حسبك الله﴾ ئەی پەیامبەر! تۆ هەر خوات بەسە بۆ چاودێریی وپاراستنت ﴿ومن اتبعك من المؤمنین﴾ بۆ ئەو بڕوادارانەش پەیڕەویت لێ ئەکەن هەر خوا بەسە .

### هانی موسڵمانان بدە بچنە جەنگ:

﴿٦٥ یاایها النبی حرض المؤمنین علی القتال﴾ئەی پەیامبەر ! ﷺ هانی باوەڕدارەکان بدە بابچنە جەنگ، لەگەڵ پێش چاوگرتنی گشت هۆکارەکانی جەنگ بە پێی توانا بۆ سەرکەوتن ﴿إن یکن منکم عشرون صابرون﴾ ئەگەر ئێوە بیست کەسی خۆ ڕاگرتان هەبێ لەم قۆناغەدا ﴿یغلبوا مأتین﴾ دەشێ بەسەر دووسەد کەسدا زاڵ بن (یەك بەدە) واتە: دەکرێ یەك کەستان بەرامبەری دەکەس ڕاوەستێت ﴿وإن یکن منکم مائة یغلبوا الفا من الذین کفروا﴾ هەروا ئەگەر سەد کەسی خۆڕاگرتان هەبێ، ئەوا بەئیزنی خوا زاڵدەبن بەسەر هەزار کەسی کافردا ﴿ذلك بأنهم قوم لا یفقهون﴾ چونکە ئەوانە خەڵکانێکی تێ نەگەیشتوون .
بەڵێ.. وەك (ئیبن عەباس) ئەڵێ: لە سەرەتای هاتنی دینی ئیسلامەوە دەبوو یەك کەس بەرامبەر دەکەس ڕاوەستابا، چونکە موسڵمانەکان کەم و لاوازو بێ دەسەڵات بوون، دیارە بڕیاری وا لەسەر شانیان قورس و سەختبوو، بۆیە نەسخ بوویەوەو فەرمووی:
﴿٦٦ الآن خفف الله عنکم﴾ هەر ئێستا خواکاری بۆ ئاسانکردن ﴿وعلم ان فیکم ضعفا﴾ و زانی کەوزەو دەسەڵاتتان کەمەو، کز ولاوازن ﴿فإن یکن منکم مائة صابرة﴾ جا ئەگەر سەد کەسی خۆراگرو بە ئارامتان هەبێ ﴿یغلبوا مأتین﴾ دەرەقەتی دووسەد کەسیان دێن ﴿وإن یکن منکم الف﴾ خۆ ئەگەر یەك هەزار کەسی خۆ ڕاگرتان هەبێ ﴿یغلبوا الفین بإذن الله﴾ ئەوا بەفەرمان و بڕیاری خوا دەرەقەتی دووهەزار کەسیان دێن، بۆ دوایش وا بڕیار درا کە: ئەگەر ژمارەی موسڵمانان نیوەی ژمارەی خوا نەناسان بوو،دەبێ بەرامبەریان بجەنگێن وخۆڕاگربن، خۆ ئەگەر وا نەبوو ،دەتوانن لەوشەڕە خۆلابدەن ﴿والله مع الصابرین﴾ خوایش لەگەڵ خۆڕاگرانە.



وَإِن يُرِيدُوٓاْ أَن يَخۡدَعُوكَ فَإِنَّ حَسۡبَكَ ٱللَّهُۚ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَيَّدَكَ
بِنَصۡرِهِۦ وَبِٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٦٢﴾ وَأَلَّفَ بَيۡنَ قُلُوبِهِمۡۚ لَوۡ أَنفَقۡتَ
مَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا مَّآ أَلَّفۡتَ بَيۡنَ قُلُوبِهِمۡ وَلَٰكِنَّ
ٱللَّهَ أَلَّفَ بَيۡنَهُمۡۚ إِنَّهُۥ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ﴿٦٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ حَسۡبُكَ
ٱللَّهُ وَمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٦٤﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ حَرِّضِ
ٱلۡمُؤۡمِنِينَ عَلَى ٱلۡقِتَالِۚ إِن يَكُن مِّنكُمۡ عِشۡرُونَ صَٰبِرُونَ
يَغۡلِبُواْ مِاْئَتَيۡنِۚ وَإِن يَكُن مِّنكُم مِّاْئَةٞ يَغۡلِبُوٓاْ أَلۡفٗا مِّنَ
ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِأَنَّهُمۡ قَوۡمٞ لَّا يَفۡقَهُونَ ﴿٦٥﴾ ٱلۡـَٰٔنَ خَفَّفَ
ٱللَّهُ عَنكُمۡ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمۡ ضَعۡفٗاۚ فَإِن يَكُن مِّنكُم مِّاْئَةٞ
صَابِرَةٞ يَغۡلِبُواْ مِاْئَتَيۡنِۚ وَإِن يَكُن مِّنكُمۡ أَلۡفٞ يَغۡلِبُوٓاْ أَلۡفَيۡنِ
بِإِذۡنِ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿٦٦﴾ مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ
لَهُۥٓ أَسۡرَىٰ حَتَّىٰ يُثۡخِنَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ تُرِيدُونَ عَرَضَ ٱلدُّنۡيَا
وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلۡأٓخِرَةَۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ﴿٦٧﴾ لَّوۡلَا كِتَٰبٞ مِّنَ
ٱللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمۡ فِيمَآ أَخَذۡتُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿٦٨﴾ فَكُلُواْ مِمَّا
غَنِمۡتُمۡ حَلَٰلٗا طَيِّبٗاۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٦٩﴾

**نابێ بەر لەدەسەلات دیل رابگیردرێ:**

ئیمامی(مسلیم) ئەڵێ: (عومەری کوڕی خەتتاب/ خوا لێی رازی بێ) وتی: کاتێ کە لەبەدرا قوڕەیش حەفتایان لێکوژراو، حەفتاشیان لێ دیلکرا، پەیامبەر ﷺ لە بارەی دیلەکانەوە پرس و ڕاوێژی بەهاوەڵانکرد: ئایا چی بکرێ باشە! (ئەبو بەکر/ خوا لێی رازی بێ) وتی: من پێم چاکە فیدیەو بریتیان لێ وەربگیردرێ، تا خۆمانی پێ بەهێز بکەین، لەولایشەوە بەڵکو لە ئایندەدا خوا ڕێنمایان بکاو موسڵمان ببن, پەیامبەر ﷺ فەرمووی: ئەی کوڕی خەتتاب ! تۆ ڕات چییە ؟ (عومەر)یش وتی: من وام پێ چاکە فلانی خزمم بدەیتە دەست با بیکوژم، (عەقیل)ی ئامۆزایشت بدە دەستی (عەلی)با بیکوژێ، فلانە کەسیش بدە دەستی (حەمزە) با بیکوژێ، تا هەموو کەسێ بزانێ کە: ئێمە لەگەڵ کافراندا نەرم ونیان نین، بەتایبەتی ئەوانەیان سەرۆك و پێشەوای کوفرن، پەیامبەریش ﷺ راو بۆچوونەکەی (ئەبووبەکر)ی قەبووڵ کرد ! (عومەر) گوتی: جا بۆ سبەینێ چووم دیتم وا پەیامبەرو ئەبوبەکر-هەردوو-خەفەتبارن و ئەگرین، منیش وتم: پێم بڵێن چی قەوماوە ؟! فەرمووی: بۆ ئەوە دەگریم کەهاوەڵان فیدیەو بریتیان هەڵبژارد، ئینجا خوا ئەم ئایەتەی دابەزاندو فەرمووی: ﴿[٦٧] ماکان لنبی أن یکون لە اسری﴾ بە هیچ پەیامبەرێك رێ نەدراوە کە دیلی هەبێ و، دیل ڕاگرێ ، یان بریتی وەرگرێ ﴿حتی یثخن فی الأرض﴾ هەتا هێزو دەسەلات بەدەست دەگرێت ﴿تریدون عرض الدنیا﴾ ئێوە دەتانەوێ لەززەت و کاڵای دونیاتان دەسکەوێ لەوەرگرتنی بریتیدا ﴿والله یرید الآخرة﴾ خوایش پاشە ڕۆژی ئەوێ بۆتان، ئەیەوێ پاداشی گەورەومەزنتان دەستکەوێ و، پاشە ڕۆژ هەڵبژێرن.

**تێبینی یەك:** ئەم گلەیی وعیتابە روو لەوکەسانە دەکات پێغەمبەر راوێژی پێکردن وئەوانیش فیدیەیان هەڵبژارد ﴿والله عزیز حکیم﴾ خوا بۆخۆی زۆر بەدەسەڵات وزۆریش کارجوانە ﴿[٦٨] لولا کتاب من الله سبق﴾ ئەر پێشتر لەخواوە بڕیاردەرنەچووبا کەسزای هەڵەکار -بە ئیجتیهاد- نەدات ﴿لمسکم فیما أخذتم عذاب عظیم﴾ لە وبریتی وەرگرەتنەتاندا سزایەکی گەورەتان دووچار دەبوو وقاری لێدەگرتن ﴿[٦٩] فکلوا مما غنمتم حلالا طیبا﴾دەسا لەودەسکەوتە گرتووتانە بخۆن بە حەلاڵی وپاکی ﴿واتقوا الله﴾ وە لەخوا بترسن ﴿إن الله غفور رحیم﴾ بەڕاستیی خوا زۆر لێبوردەیە، زۆر دلۆڤان و میهرەبانە، لەهەڵەی نەزان دەبوورێ.

**کوڕی زانایان دەڵێن:** پێشەوای موسڵمانان خۆی سەر پشکە -سەبارەت بەدیل- ئاخۆ دەیانکوژێ، وەکو یەخسیرەکانی (بەنی قورەیزە) یان فیدیەو بریتیی وەردەگرێ وەکو دیلەکانی (بەدر) وەیان دیل بەدیل بکا ﴿[٧٠] یا أیها النبی قل لمن فی أیدیکم من الأسری﴾ ئەی پەیامبەر ﷺ بەدیلەکانی ژێر دەستت بڵێ: ﴿إن یعلم الله فی قلوبکم خیرا﴾ ئەگەر خوا بزانێ چاکەیەك لەدڵتانایە، بڕوایەکی پاك وچاك دەبێ بەدینی ئیسلام ﴿یؤتکم خیرا مما أخذ منکم﴾ لەوەی لێتان وەرگیراوە باشترتان دەداتێ ﴿ویغفر لکم﴾ و گوناهە پێشووەکانیشتان دەبوورێ. پێشەوا (موسلیم)دەڵێ: ئەو دەمە کە لە(بەحرەین)ەوە ماڵ و سامانێك دەسکەوت و هات، (عەباس)ی مامی پێغەمبەر ﷺ بە پێغەمبەری گوت: خۆت دەزانی کە: من هەم فیدیەی خۆم و، هەم هی (عەقیل)یشم داوە، ئێستا هەقە لەوماڵەیە قەرەبووی بکەیتەوە بۆم، ئەوجا ئەویش پارچە قوماشێکی راخست و چەندەی حەز لێبوو بردی ﴿والله غفور رحیم﴾ و خواش زۆر چاوپۆشە لەهەڵەوتاوان ، زۆریش دلۆڤانە. ئەوکاتە کەپەیامبەر ﷺ فیدیەکەی لێوەرگرتن زۆر بەقورسیان زانی، جابۆ وەڵامی ئەوە ئەوئایەتەی سەرەوە هات و، تێیگەیاندن کە: بە قازانجیان تەواودەبێ ﴿[٧١] وإن یریدوا خیانتك﴾ خۆ ئەگەر- دیلەکان- دەیانوسیت -بەئیسلام بوونەکەیان فرت و فێڵ و خیانەتت لەگەڵ بکەن و، لەدڵەوە بەڕاستیان نەبوو ﴿فقد خانوا الله من قبل﴾ بەراستیی پێش دیل کردنیشیان لەگەڵ خوا خیانەتیان کردو

ناراس بوون ﴿فأمكن منهم﴾ ئەوسا خوایش ئێوەی زاڵکرد بەسەریاندا و تیێشکاندن، جا ئێستاش ئەگەر شتی وا بکەنەوە ئێمەش وایان لێدەکەینەوە ﴿والله علیم حكیم﴾ خوا زانایە، لەکارزان و کارجوانە، ئەزانێ چی باشە بۆ مەردوم.

## موهاجرو ئەنصار بوونە یەکدەستە :

ئەم سورەتی(ئەنفال)ـە بە باسێکی (موالات) کۆتایی دێت ، هەتا هەموو کەسێك دۆست و پشتیوان و (وەلیی) خۆی بناسیٚ و لێیلانەدا، بۆیەدەفەرموێ :﴿[٧٢] إن الذین آمنوا﴾ بیٚ سۆ ئەوانەی باوەڕیان هێنا ﴿وهاجروا﴾ و لەزێدو ولات و نیشتمانی خۆیان - لەبەر خۆشەویستی خواو پەیامبەرەکەی- کۆچیانکرد ﴿وجاهدوا بأموالهم وانفسهم فی سبیل الله﴾ ولەڕای خوادا - بەسامان وگیانیان- جیهادیان کرد ﴿والذین آووا ونصروا﴾ و ئەوانەش کە کۆچەرەکانیان بەخۆوە گرتوو و یارمەتییاندان ﴿اولئك بعضهم اولیاء بعض﴾ ئەمانە گشت دەبنەخزم و کەس و کاری یەکتر ومیراتیش لە یەکتر دەبەن ﴿والذین آمنوا﴾ ئەوانەش کە باوەڕیان هێنا ﴿ولم یهاجروا﴾ وهەر لە مەککەشدا مانەوەو کۆچیان نەکرد" بۆ مەدینە" ﴿مالكم من ولایتهم من شئ﴾ ئێوە هیچ هەقێکتان بەسەریانەوە نیە، واتە: میرات لەیەك نابەن و، لەسەرتان نییە یارمەتیشیان بدەن، وە لەدەسکەوتی جەنگیش بەشنابەن ﴿حتی یهاجروا﴾ هەتا ئەوانیش وەکو ئێوە لەوڵاتی کوفر هیجرەت دەکەن ﴿وإن استنصروکم فی الدین فعلیكم النصر﴾ خۆ ئەگەر داوای یارمەتییان لێکردن بۆ پاراستنی ئایینەکەیان، دەبیٚ ئێوەش یارمەتییان بدەن و سەریانخەن بەسەر دوژمنانی هەردوولاتاندا ﴿إلا علی قوم بینكم وبینهم میثاق﴾ مەگەر دژی ئەوانە لەگەڵ ئێوە هاوپەیمانن و رێکەوتننامەیان مۆرکردبیٚ ئەگەر چی کافریش بن، لەو دەمەدا نابیٚ یارمەتییان بدەن ﴿والله بما تعملون بصیر﴾ خوا بە هەموو کردەوەکانتان بیناو بەئاگایە، بەم ئایەتانە پەیوەندیی و دۆستایەتی لەنێوان ئیمانداران و خوا نەناساندا قەدەغە کرا. خوای بە بەزەیی موسڵمانەکانی کردە سیٚ بەشەوە: کۆچکەران، پشتیوانان ، کۆچ نەکەران. کۆچکەران پێش دەخا،چونکە ئەوانن بناغەی دینی ئیسلام، پاشانیش باسی پشتیوانان دەکات، چونکە لەو رۆژە تەنگەدا دەستی کۆچ کەرەکانیان گرت و، خوایش مافی (وەلایە)ی خستە نێوانیانەوە, ئەو موسڵمانانەش کۆچیان نەکرد هەتا کۆچ نەکەن مافی(وەلایە)یان نیە .

الجزء العاشر — سورة الأنفال

يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّمَن فِي أَيْدِيكُم مِّنَ الْأَسْرَىٰ إِن يَعْلَمِ اللَّهُ
فِي قُلُوبِكُمْ خَيْرًا يُؤْتِكُمْ خَيْرًا مِّمَّا أُخِذَ مِنكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ
وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٧٠﴾ وَإِن يُرِيدُوا خِيَانَتَكَ فَقَدْ خَانُوا
اللَّهَ مِن قَبْلُ فَأَمْكَنَ مِنْهُمْ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٧١﴾ إِنَّ الَّذِينَ
آمَنُوا وَهَاجَرُوا وَجَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ
اللَّهِ وَالَّذِينَ آوَوا وَّنَصَرُوا أُولَٰئِكَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ وَالَّذِينَ
آمَنُوا وَلَمْ يُهَاجِرُوا مَا لَكُم مِّن وَلَايَتِهِم مِّن شَيْءٍ حَتَّىٰ يُهَاجِرُوا
وَإِنِ اسْتَنصَرُوكُمْ فِي الدِّينِ فَعَلَيْكُمُ النَّصْرُ إِلَّا عَلَىٰ قَوْمٍ
بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَاقٌ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٧٢﴾ وَالَّذِينَ
كَفَرُوا بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ إِلَّا تَفْعَلُوهُ تَكُن فِتْنَةٌ فِي
الْأَرْضِ وَفَسَادٌ كَبِيرٌ ﴿٧٣﴾ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَهَاجَرُوا
وَجَاهَدُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالَّذِينَ آوَوا وَّنَصَرُوا أُولَٰئِكَ هُمُ
الْمُؤْمِنُونَ حَقًّا لَّهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٧٤﴾ وَالَّذِينَ آمَنُوا مِن
بَعْدُ وَهَاجَرُوا وَجَاهَدُوا مَعَكُمْ فَأُولَٰئِكَ مِنكُمْ وَأُولُو الْأَرْحَامِ
بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ فِي كِتَابِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴿٧٥﴾

١٨٦ — براءة من

## خوا نەناسانیش گشت یەکتاقمن و ، نابیٚ بکرێنە دۆس:

﴿[٧٣] والذین کفروا بعضهم اولیاء بعض﴾ ئەوانەش خوانەناس و بیٚ باوەڕن دۆست و هاوکاری یەکترن، کەوابوو نابیٚ- لەلایەن موسڵمانانەوە- یارمەتیی وهاوکاری بکرێن ﴿إلا تفعلوه﴾ خۆ ئەگەر ئێوە بەوشێوە نەکەن فەرمانتان

پێکراوە" واتە: موسڵمانان نەکەنە دۆست و هاوکارو، خوا نەناس وکافرانتان کردە دۆست و هاوکار ﴿تكن فتنة فى الأرض وفساد كبير﴾ کارەساتێکی گەورەو فەسادو ئاژاوەیەکی سامناك لەرووی زەویی سەرهەڵدەدا، چونکە موسڵمانەکان بێ هێزو لاواز دەبن و، بێ باوەڕەکان بەهێز دەبن. بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ خەڵکی دوو ئایین لێکجیاواز میرات لەیەك نابەن، هەروەکو موسڵمان لەکافرو، کافر لە موسڵمان میرات نابەن، پاشان ئایەتی: (والذین کفروا بعضهم أولیاء بعض..)ی خوێندەوە.

**ئیمانداری راستەقینە بناسە:**

﴿[74] والذين آمنوا وهاجروا وجاهدوا فى سبيل الله﴾ ئەوانەش بروایان هێناوەو کۆچیان کردووەو تێکۆشاون لە ڕای خوادا ﴿والذين آووا ونصروا﴾ ئەوانەش" کۆچکەرەکانیان پەناداو یارمەتییان دان ﴿أولئك هم المؤمنون حقا﴾ ئەمانەن باوەڕداری بەهەق ﴿لهم مغفرة ورزق كريم﴾ لێبوردن و ڕۆزییەکی باش و قەشەنگیان هەیە ﴿[75] والذين آمنوا من بعد﴾ ئەوانەش دواتر باوەڕیان هێنا ﴿وهاجروا وجاهدوا معكم﴾ و هیجرەتیان کردو لە گەڵ ئێوەشدا جیهادیان کرد ﴿فأولئك منكم﴾ ئەوانە لەئێوەن، ئەگەرچی پاداشی ئێوەشیان نەبێت، کەوابوودەبێ ئەمانەیش یارمەتیی و هاوکاریی بکرێن ﴿وأولوا الأرحام بعضهم أولى ببعض فى كتاب الله﴾ خزم بۆ خزم – بەپێی کتێبی خوا نزیکترن – بۆ میرات لە یەکتر گرتن. ئەم ئایەتە ئەو جۆرە میرات بردنە هەڵئەوەشێنێتەوە کە بەهۆی برایەتیی و هاوپەیمانیەوە لە یەکتریان دەگرت، دەیگێڕێتەوە بۆ سەر بنەماکەی خۆی کەبە خزمایەتیە. ﴿إن الله بكل شئ عليم﴾ بە ڕاستی خوا بە هەموو شتێك زانایە، هەموو شتێك لای ئەو حیکمەتێکی تێدایە، واتە: ئەگەر میراتگری پشتیی نەبوو، خزمە نزیکەکان شایستە ترن لە بێگانەکان.

سوپاسێکی بێ وێنە، بۆ خوای تاك وبێ وێنە، کە یارمەتیدام بۆ تەواو کردنی تەفسیری سوورەتی (ئەنفال).

وصلى الله وسلم وبارك على محمد وآله وصحبه و كل من والاه.

*** *** ***

## ٩- سوورەتی (تەوبە )ـە

## مەدەنییەو (١٢٩) ئایەتە

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

ئەم سوورەتە گرنگییەکی تایبەتی دەدا بەلایەنی یاساو بەرنامە بۆکارە پێویستییەکان، یاسا بۆ پەیوەندیی ناوخۆیی و، دەرەوەی موسڵمانان لەگەڵ دەوڵەتاندا دەنووسێ. ئیمامی (بوخاریی) لە (بەرا ء)ی کوڕی (عازەب)ـەوە ئەگێڕێتەوە کە: سوورەتی (بەرائە) لەدوای گشت سوورەتەکانی قورئانەوە هاتۆتە خوارەوە. ئەم سوورەتە دوو ئامانجی سەرەکیی هەیە: یەکەم: دانانی بەرنامە بۆشێوەی چۆنیەتی مامەڵەو هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ موشریك و خاوەن نامەکاندا. دووەم: باسی ئەو کەسانە دەکات کە پەیامبەر ﷺ کاتێ بانگیکردن بۆ خۆئامادەکردن بۆ جەنگی(ڕۆم)ـەکان هەر ئەمڕۆو بەیانیان دەکردو نەچوون.

دوو ڕوونکردنەوە: یەکەم : ئەگەر بەوردیی سەرنجی دەقەکانی سوورەتی (بەرائە) بدرێ و، ئەو ریوایەتانەی دەربارەی هاتنی سورەتەکە وتراون لەگەڵ ڕووداوەکانی ژیانی پەیامبەردا ﷺ بەراوردێ بکرێن ، دەرئەکەوێ کە: تەواوی سورەتەکە لە ساڵی نۆیەمی کۆچییدا هاتووە، بەڵام نەك لەسەریەك ، بەڵکو بە سێ قۆناغدا تێپەڕیوە.. یەکەمیان: لەمانگی(ڕەجەب)ی هەمان ساڵداو پێش ڕوودانی (تەبووك). دووەمیان: لەکاتی خۆ ئامادەکردندا بۆ ئەو غەزایەو لە

ناوەڕاستییدا. سێیەم: پاش گەڕانەوە لە تەبووك.. سەرەتای سوورەتەکە بۆ کۆتایی ئایەتی (٢٨) لە ئاخرو ئۆخری ساڵی نۆیەمدا هات، کەمێك پێش هاتنی کاتی حەج. دووەم: پاش ئەوە پەیامبەر ﷺ لە تەبووك گەڕایەوە ویستی بچێت بۆ حەج، بەڵام نیازەکەی گۆڕیی و فەرمووی: ئێستا هاوبەشداکارەکانیش بە رووت و قووتی دێن بۆ حەج و بە دەوری (کابە)دا ئەسوڕێنەوە!! جالەبەر ئەوە من ئەمەوێ ئەمساڵ حەج نەکەم، هەتا ئەوانە بەوشێوەیە نەبینم، جا لەبەرئەوە (ئەبوبەکری) کردە ئەمیرو چاودێرو سەرپەرشتی حەجی ئەوساڵەو ناردی. ئینجا بۆ دوایی سەرەتای سورەتی (تەوبە) هات و (عەلی کوڕی ئەبو تالیب)یشی بە دوای ئەبوبەکردا نارد، بۆئەوە کە ئەم چوار بڕیارە بخوێنێتەوە بەسەر موشریك و خوا نەناسەکاندا:

سُورَةُ التَّوبَةِ — الجُزءُ العَاشِرُ

سُورَةُ التَّوبَةِ — آياتها ١٢٩ — ترتيبها ٩

الحزب ١٩

بَرَآءَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١﴾
فَسِيحُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّكُمْ غَيْرُ مُعْجِزِى
ٱللَّهِ وَأَنَّ ٱللَّهَ مُخْزِى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٢﴾ وَأَذَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ
إِلَى ٱلنَّاسِ يَوْمَ ٱلْحَجِّ ٱلْأَكْبَرِ أَنَّ ٱللَّهَ بَرِىٓءٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ
وَرَسُولُهُۥ ۚ فَإِن تُبْتُمْ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ وَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَٱعْلَمُوٓا۟
أَنَّكُمْ غَيْرُ مُعْجِزِى ٱللَّهِ ۗ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ
﴿٣﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ثُمَّ لَمْ يَنقُصُوكُمْ
شَيْـًٔا وَلَمْ يُظَٰهِرُوا۟ عَلَيْكُمْ أَحَدًا فَأَتِمُّوٓا۟ إِلَيْهِمْ عَهْدَهُمْ إِلَىٰ
مُدَّتِهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٤﴾ فَإِذَا ٱنسَلَخَ ٱلْأَشْهُرُ ٱلْحُرُمُ
فَٱقْتُلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ وَٱحْصُرُوهُمْ
وَٱقْعُدُوا۟ لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ ۚ فَإِن تَابُوا۟ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ
وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّوا۟ سَبِيلَهُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥﴾
وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ٱسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ
كَلَٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُۥ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْلَمُونَ ﴿٦﴾

١٨٧

١- نابێ جارێکی تر هیچ کەسێك بە دەوری کابەدا بەڕووتی تەواف و چەرخە بکات.

٢- دوای ئەمساڵ هیچ هاوبەش پەیداکارێك نزیکی (کابە) نەبێتەوە.

٣- هەر رێکەوتننامەیەك لەگەڵ پەیامبەردا ﷺ مۆرکراوە، ئەوە تا ئەوکاتە کاری پێدەکرێت بۆی دیاریکراوە.

٤- تەنها موسڵمان دەچێتە بەهەشتەوە.

سەرەتای ئەم سورەتە -وەکو سوورەتەکانی دیکەی قورئان- (بسم الله الرحمن الرحيم)ی تێدا نیە، چونکە لەتووڕەیی ورك و قینی خوا بەرامبەر بەموشریکەکان باس دەکات.

**خوا چارەی موشریکانی ناوێ:**

﴿[1] براءة من الله ورسوله إلى الذين عاهدتم من المشركين﴾ ئەمە بێزاریی و دەستبەردانی خواو پەیامبەرەکەی لەو موشریکانە کە ئێوە پەیمانتان لەگەڵ بەستن وراستیان نەکرد لە گەڵتاندا. ئەوعەرەبانە کە لەو دەوروبەرەدا بوون وپەیمانیان مۆر کردبوو، ورده ورده دەستیان دایە هەڵوەشاندنەوەی پەیمانەکەیان، ئەوسا خوایش فەرمانیدا بە پەیامبەر ﷺ کە ئەویش پەیمانی خۆی لەگەڵیان هەڵوشێنێتەوەو چوار مانگیشیان مۆڵەت بدات بۆ چارەسەری خۆیان، وەکو دەفەرموێ: ﴿[2] فسيحوا فى الأرض أربعة أشهر﴾ با بۆ ماوەی چوار مانگ بە ئاسوودەیی وهێمنیی و بێ هیچ ترسێك بۆخۆیان بەسەر بەستیی بێن و بچن و، هیچ کەسێکیش بەنیازی خراپەوە سەیریان نەکات ﴿واعلموا انكم غير معجزى الله﴾ وپێیشیان بڵێن با بزانن: کە ئێوە هەرگیز لەدەست خوا دەنارچن و، ناتوانن دەستەوسانی بکەن ﴿وان الله مخزى الكافرين﴾ وبشزانن کە: خوا ئابڕو بەرو ریسواکەری گشت دوژمنان و بێ باوەڕانە، لە دونیادا بە دیل کردنیان دەداو، کوشتنیان حەڵاڵ دەکا، (موحەممەدی کوڕی ئیسحاق) ئەڵێ: ئەوانە کە خوای گەورە بەرائەتی لێکردن، دوو کۆمەڵبوون لە هاوبەشدانەرەکان: یەکێکیان لەگەڵ ئەوەیشدا

کەماوەی پەیمانەکەی کەمتر بوو لە چوار مانگ، ماوەکەی بۆدرێژ کرایەوە بۆ چوار مانگ ، ئەویکەشیان لەگەڵ ئەویشدا کە ماوە بۆ پەیمانەکەی دیاری نەکرا بوو، بۆیکرایە چوار مانگ ، هەتا باشتر بە خۆیاندا بچنەوەو کۆتا بڕیاری خۆیان بدەن، چونکە پاش ئەو ماوەیە ئیتر جەنگ دەکرێ لەگەڵیان ﴿[3] وأذان من الله ورسوله إلى الناس﴾ و ئەمە ئاگاداریە کە لەلایەن خواو پەیامبەرەکەیەوە ﷺ بۆ هەمووخەڵك ﴿يوم الحج الأكبر﴾ کە سەرەتاکەی ڕۆژی یەکەمی مانگی حەجی (ئەکبەر)ـە، واتە: ڕۆژی یەکەمی (جەژنی قوربان) رادەگەیەنرێت . (موجاهید) ئەڵێت: مەبەست بە حەجی گەورە: ئیحرام بە حەج بەستنە، حەجی بچووکیش ئیحرام بەستنە بە عومرە، چونکە ئەرك و پایەکانی ئەم لە حەج کەمترە. هەندێك لە زاناکان دەڵێن: ڕۆژی حەجی ئەکبەر: ڕۆژی عەرەفەیە، هەندێکی دیکە ئەڵێن: ڕۆژی جەژنی قوربانە.(تەبەریی)ش ئەمەی هەڵبژاردووە , چونکە پەیامبەرﷺ کاتێ (عەلی)نارد فەرمووی: (إذهب بهذه القصة من سورة براءة وأذن فی الناس یوم النحر اذا اجتمعوا بمنی: أنه لایدخل الجنة کافر، ولا یحج بعد العام مشرك ، ولا یطوف بالبیت عریان، ومن كان له عهد عند رسول الله فهو له إلى مدته) واتە: دەبچۆ ئەم داستانەی سوورەتی (بەرائە)یان بۆ بخوێنەوەو، لەڕۆژی جەژنی قوربانیشدا کە خەڵك لە (مینا) کۆ دەبێتەوە، ئەم بڕیارەیان پێڕابگەیەنە کە: کافرو خوانەناس ناچێتە بەهەشت، ساڵێکی تر نابێ هیچ کەسێکی (موشریك) حەج بکاو خەڵکی بە رووتی تەواف بکا، هەرکەسێکیش پەیمانێکی لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ هەبێ، بەردەوامە تاکاتی خۆی ﴿أن الله برئ من المشركين ورسوله﴾ هەموو ئاگاداربن! کە بێگومان خواو پێغەمبەرەکەی بەرین لە موشریکەکان، واتە: ئیتر هیچ ئیعتیبارێك بە پەیمانیان نیە ﴿فإن تبتم فهو خير لكم﴾ جا ئەگەر پەشیمان ببنەوەو بگەڕێنەوە بۆ یەکخواپەرستیی، باشترە بۆتان لە مانەوەتان لەسەر شیرك ﴿وإن توليتم﴾ وئەگەر پشتیشتان لە ئیمان وباوەڕ هەڵکرد ﴿فاعلموا أنكم غير معجزى الله﴾ چاك بزانن کە ئێوە هەرگیز لە دەست خوا دەرناچن، ناتوانن دەستەوسانی بکەن ﴿وبشر الذين كفروا بعذاب أليم﴾ ئەوکەسانەش بێ باوەڕن بە سزایەکی ئێش پێگەیەنەر مژگێنیان بدە ! .

**لەگەڵ پەیمانشکێن مامەڵەی تایبەتی دەکرێ:**

﴿[4] إلا الذين عاهدتم من المشركين﴾ واتە: لەگەڵ هەموویان پەیمان هەڵوەشێننەوە ، مەگەر ئەوموشریکانە کەپەیمانتان لەگەڵ بەستوون و هەڵیان نەوەشاندۆتەوە ﴿ثم لم ينقصوكم شيئا﴾ و هیچ مەرجێکیشیان لێکەم نەکردووە، واتە: خیانەتیان لەگەڵنەکردوون ﴿ولم يظاهروا عليكم أحدا﴾ ودژی ئێوەش کۆمەکی هیچ کەسێکیان نەکردووە بۆ هێرش هێنانە سەرتان، نە بەچەك و نە بەپیاو ﴿فأتموا إليهم عهدهم إلى مدتهم﴾ ئێوەش پەیمانی ئەوانە ڕاگرن هەتا کاتەکەیان تەواو دەبێت ، ئەگەر چی لە چوار مانگیش زیاتر بێت ﴿إن الله يحب المتقين﴾ بێگومان خوا پارێزکارانی خۆش ئەوێ ، ئەوانەی ڕێزی ڕێکەوتننامە ئەگرن، جا کەواتە ڕێزگرتن لە پەیمان و ڕێکەوتننامە بنەماو بناغەیەکی پیرۆزی دینی ئیسلامە ﴿[5] فإذا انسلخ الأشهر الحرم﴾ ئینجا کە مانگە حەرام و خاوەن ڕێزەکان بڕانەوە ، واتە: ئەوانەی کەجەنگیان تیا قەدەغەکراوە، کە ئەوانیش ئەم چوار مانگەن: (زیقەعەدە، زیحەججە، موحەڕڕەم، ڕەجەب) وەکو لەئایەتی(٣٦)ی ئەم سوورەتەشدا هاتووەو دەفەرموێ: (منها أربعة حرم ذلك الدين القيم فلا تظلموا فيهن أنفسكم..) ﴿فاقتلوا المشركين حيث وجدتموهم﴾ دەسا ئێوەش لە هەرجێگایەکدا موشریکەکانتان دەستکەوت بەمەرجێ (ژن و منداڵ و گۆشەگیر نەبن) " لە حەرەم و لە دەرەوەی حەرەم، لەچوار مانگەکان و، لەغەیری چوار مانگەکانیشدا" بیانکوژن ﴿وخذوهم﴾ و بیبانگرن و "دیلیان بکەن" ﴿واحصروهم﴾ وگەمارۆیان بدەن و"مەهێڵن بەملاو بەولادا بچن " ﴿واقعدوا لهم كل مرصد﴾ وەلە هەموو کەمین و ڕێگەیەکیشدا بۆیان دانیشن ﴿فإن تابوا﴾

ئینجا ئەر پەشیمان بوونەوە لە هاوبەشدانان بۆ خوا ﴿وأقاموا الصلاة﴾ و بەرێك و پێكی نوێژیان ئەنجامدا ﴿وآتوا الزكاة﴾ و زەكاتیان جێبە جێ كرد ﴿فخلوا سبيلهم﴾ ئێوەیش ڕێگەیان بۆ چوڵ بكەن و "هەقتان بەسەریانەوە نەبێ، با بێن و بچنە ناو حەرەمیشەوە" ﴿إن الله غفور رحيم﴾ بە ڕاستیی خوا لەگوناح زۆر لێبوردەیە، زۆریش دلۆڤان و میهرەبانە بەرامبەر بەتەوبەكاران.

**ئەر موشریك داوای پەنابكا، داڵدە دەدرێت:**

﴿٦ وإن أحد من المشركين استجارك فأجره﴾ ئەر یەكێك لەو موشریكانە پەنای پێهێنایت ، پەنای بدە" داڵدەی بدە ﴿حتی يسمع كلام الله﴾ هەتا بەباشی فەرمایشتی خوا دەبیسێ و لێی حاڵی دەبێ، واتە: قورئانی بۆدەخوێنیت و لێی تێدەگات ﴿ثم ابلغه مأمنه﴾ پاشان بیگەیەنە وەجێیەك كە هێمن وئاسوودەبێ و، لەهیچ نەترسێت، زانایان رایان وایە: ئەوكەسانە دێنە وڵاتی ئیسلامییەوەو بۆ هەر شتێك هاتبن –بە مەرجێ بە شێوەی پرس و ڕاهاتبن و مۆڵەتدرابن– ئەوا پارێزراو دەبن. ﴿ذلك بأنهم قوم لا يعلمون﴾ چونكە ئەوانە گەلێكن نازانن ئیمان وبڕوا چییە، سا بەڵكو بەو پەنادانە بیرێ بكەنەوەو لەئیسلام تێبگەن ﴿٧ كيف يكون للمشركين عهد عند الله وعند رسوله﴾ چۆن بۆ موشریكان پەنا هەبێت بەلای خواو پێغەمبەرەكەیەوە؟ كاتێ ئەوان پەیمان هەڵوەشێننەوەو لەسەر بێ باوەڕی خۆیان بمێننەوەو بەئاسوودە بێن وبچن؟ ﴿إلا الذين عاهدتم عند المسجد الحرام﴾ بۆ ئەو كەسانە نەبێت كە لەلای مزگەوتی (حەرام)دا پەیمانتان لەگەڵ بەستن و، ئەوانیش پەیمانەكەیان هەڵنەوەشاندەوە ، وەكو هۆزی (خوزاعە) ﴿فما استقاموا لكم﴾ ئەوانە هەتا بەرێك و پێكی لەسەر پەیمانەكەیان بن و وەفاداربن ﴿فاستقيموا لهم﴾ دەبێ ئێوەیش پەیمانەكەیان بەرێك و پێك ڕاگرن و وەفاداربن. پێغەمبەری خوا پەیمانی لەگەڵ قورەیشدا بۆماوەی دەساڵ مۆر كرد ، هەتا ئەوان خەیانەتیان نەكرد ئەم وەفای بە پەیمانەكەی خۆیكرد ﴿إن الله يحب المتقين﴾ بە ڕاستی خوا پارێزكارانی خۆشدەوێ، ئەوانەی وەفادارن و پەیمان شكێن نین. بەڵێ.. پێغەمبەرﷺ لە مانگی زیقەعدەی ساڵی شەشەمی كۆچیی لە (حودەیبیە) ئاگر بەستی لەگەڵ قورەیشدا ، بۆماوەی (١٠) ساڵ مۆر كرد، ئیتر خۆی و موسڵمانەكان پابەند بوون پێیەوە ، هەتا قورەیش پەیمانەكەیان شكاندو هاوكاری (بەنی بەكر) یان كرد دژی (خوزاعە)ـی هاوپەیمانی پێغەمبەر ﷺ، ئەوسا ئەمیش ناچاربوو لە(٨)ـی ڕەمەزاندا لەشكری بردەسەریان و فەتحی مەككەی كردو ئەوانەیان ئیمانیان هێنا – كە نزیكەی (٢) هەزار كەس بوون– ئازادبوون. ﴿٨ كيف وإن يظهروا عليكم﴾ چۆن پەیمان لەگەڵ ئەوانەدا دەبەسرێت كە ئەگەر زاڵ بن بەسەرتانا ﴿لا يرقبوا فيكم إلا ولا ذمة﴾ نەڕەچاوی خزمایەتیتان لەگەڵ دەكەن و، نەهاوپەیمانێتی ﴿يرضونكم بأفواههم﴾ بە

سُورَةُ التَّوْبَةِ — الجُزْءُ العَاشِرُ

كَيْفَ يَكُونُ لِلْمُشْرِكِينَ عَهْدٌ عِندَ اللَّهِ وَعِندَ
رَسُولِهِۦٓ إِلَّا الَّذِينَ عَاهَدتُّمْ عِندَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ فَمَا
اسْتَقَامُوا لَكُمْ فَاسْتَقِيمُوا لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَّقِينَ
(٧) كَيْفَ وَإِن يَظْهَرُوا عَلَيْكُمْ لَا يَرْقُبُوا فِيكُمْ إِلًّا
وَلَا ذِمَّةً يُرْضُونَكُم بِأَفْوَاهِهِمْ وَتَأْبَىٰ قُلُوبُهُمْ وَأَكْثَرُهُمْ
فَاسِقُونَ (٨) اشْتَرَوْا بِآيَاتِ اللَّهِ ثَمَنًا قَلِيلًا فَصَدُّوا
عَن سَبِيلِهِۦٓ إِنَّهُمْ سَاءَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ (٩) لَا يَرْقُبُونَ
فِي مُؤْمِنٍ إِلًّا وَلَا ذِمَّةً وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُعْتَدُونَ (١٠)
فَإِن تَابُوا وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ فَإِخْوَانُكُمْ
فِي الدِّينِ وَنُفَصِّلُ الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ (١١) وَإِن نَّكَثُوا
أَيْمَانَهُم مِّن بَعْدِ عَهْدِهِمْ وَطَعَنُوا فِي دِينِكُمْ فَقَاتِلُوا
أَئِمَّةَ الْكُفْرِ إِنَّهُمْ لَا أَيْمَانَ لَهُمْ لَعَلَّهُمْ يَنتَهُونَ
(١٢) أَلَا تُقَاتِلُونَ قَوْمًا نَّكَثُوا أَيْمَانَهُمْ وَهَمُّوا
بِإِخْرَاجِ الرَّسُولِ وَهُم بَدَءُوكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ
أَتَخْشَوْنَهُمْ فَاللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَوْهُ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ (١٣)

١٨٨ — قَٰتِلُوهُمْ يُعَذِّبْهُمُ

زمانی لووسیان ڕازیتان ئەکەن ﴿وتأبى قلوبهم﴾ ودڵیان ئیبا دەکات ﴿وأكثرهم فاسقون﴾ زۆربەشیان سنوور بەزێن و پەیمان شکێنن ﴿٩ اشتروا بآيات الله ثمنا قليلا﴾ ئایەتەکانی خوایان بەنرخ و بەهایەکی زۆر کەمی دونیا فرۆشت بە (ئەبوو سوفیان) ﴿فصدوا عن سبيله﴾ بەرهەڵستی خەڵکیشیان کرد لە ڕێگەی خوا ﴿إنهم ساء ما كانوا يعملون﴾ بەڕاستیی کارێکی زۆر خراپیان کرد ﴿١٠ لا يرقبون في مؤمن إلا ولا ذمة﴾ لەگەڵ هیچ خاوەن باوەڕێکدا ڕەچاوی خزمایەتیی و هاوپەیمانیی ناکەن، هەر کات دەسەڵاتیان بوو بەسەرتانا دەستی خۆیان ئەوەشێنن" ﴿وأولئك هم المعتدون﴾ ئەمانەن دەستدرێژ کاری ڕاستەقینەو پەیمانشکێن، دەسا ئێوەش زیرەك و هۆشیاربن بەرامبەریان ﴿١١ فإن تابوا وأقاموا الصلاة وآتوا الزكاة﴾ ئینجا ئەگەر لەشیرك و بتپەرستی پەشیمان بوونەوەو ملکەچی شەریعەتی خوا بوون و، بە ڕێك و پێکی نوێژیان کردو زەکاتیان دا ﴿فإخوانكم في الدين﴾ دەبنە برای دینیتان ﴿ونفصل الآيات لقوم يعلمون﴾ و ئێمە ئایەتەکانمان بۆ خەڵکێ بزانێ شیی دەکەینەوە.

## ڕابەرانی کوفر پەیمان نابەنە سەر:

﴿١٢ وإن نكثوا أيمانهم من بعد عهدهم﴾ ئەر دوای ئیمزاو مۆر ، پەیماننامەکەیانیان هەڵوەشاندەوە ﴿وطعنوا في دينكم﴾ و توانج و تەشەریان لە ئایینەکەتان گرت ﴿فقاتلوا أئمة الكفر﴾ دەسا ئێوەش سەرانی کوفرو خوانەناسیی بکوژن . زاناکان ئەڵێن: هەر کەسێ توانج و تەشەر لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام بدا هەقە بکوژرێ . ﴿إنهم لا أيمان لهم﴾ چونکە بە ڕاستیی ئەوانە مانای هیچ پەیمانێکیان لانییە ﴿لعلهم ينتهون﴾ جەنگیان لەگەڵ بکەن، هەتا بەڵکو کۆتایی بەگێرە شێوێنیی و خراپەکاریی و، توانج و تەشەریان بێنن.

## لەگەڵ پەیمان شکێنەکان بجەنگن:

﴿١٣ ألا تقاتلون قوما نكثوا أيمانهم﴾ دەبێ بۆ لەگەڵ خەڵکانێکدا نەجەنگێن کەپەیمانی خۆیانیان هەڵوەشاندەوە و، تانەو تەشەریان لە ئایینەکەتان دا ﴿وهموا بإخراج الرسول﴾ و لێبڕان بۆ دەرپەڕاندنی پەیامبەر ﷺ لە مەککەدا ؟!. لەم سوورەتەدا ناڵێ کە بەعەمەلیی لەمەککە دەریانکرد، بەڵام لەچەند جێگایەکی تردا هاتووەو ددانی پێدادەنێ، بۆنموونە: لەسورەتی (١١/٦٠) دەفەرموێ: (يخرجون الرسول وإياكم)، یان لەسوورەتی (١٣/٤٧)دا دەفەرموێ: (وكأين من قرية هي أشد قوة من قريتك التي أخرجتك ..) یان لەسوورەتی (٩/٤٠)دا دەفەرموێ: (إلا تنصروه فقد نصره الله إذ أخرجه الذين كفروا..) یان لەسوورەتی(٨/٣٠)دا دەفەرموێ: (وإذ يمكر بك الذين كفروا ليثبتوك أو يقتلوك أو يخرجوك) یان لە سوورەتی(١٧/٧٦)دا دەفەرموێ: (وإن كادوا ليستفزونك من الأرض ليخرجوك منها ....) ﴿وهم بدؤكم أول مرة﴾ بۆ یەکەمجاریش هەر ئەوان بوون دەستیان بەجەنگ کرد لەگەڵ ئێوەدا، ئەوانبوون لەگەڵ خوزاعەدا - کە هاوپەیمانی ئێوە بوون - بەجەنگ هاتن، دە بۆ ئێوەش هەقتان نیە جەنگیان لەگەڵ بکەن ﴿أتخشونهم﴾ ئایا لێیان دەترسن ، شەڕیان لەگەڵ ناکەن ؟ ﴿فالله أحق أن تخشوه إن كنتم مؤمنين﴾ خۆ خوا شایستەترە کە لێی بترسن، ئەگەر باوەڕدارن و، ددان بەوەدا دەنێن کەئەبێ تەنها لەو بترسن ﴿١٤ قاتلوهم يعذبهم الله بأيديكم﴾ لەگەڵیان بجەنگن-ئەی بڕواداران !-ئەوساخوایش بەدەستی ئێوە سزایان دەدا ﴿ويخزهم﴾ و لەبەر دەستیشتاندا ریسوایان دەکات ﴿وينصركم عليهم﴾ و سەرتان ئەخات بەسەریاندا ﴿ويشف صدور قوم مؤمنين﴾ و کاریێ دەکا کوڵی دڵی بڕوادارانیش -بەتایبەتی (خوزاعە/ دابمرکێ بەسەرخستنی ئایینی ئیسلام و تۆڵە سەندنەوە لێیان ﴿١٥ ويذهب غيظ قلوبهم﴾ وە ڕك و تووڕەیی دڵیشیان لادەبات و دڵخۆش دەبن ﴿ويتوب الله على من يشاء﴾ کێیش تەوبە بکاو پەشیمان بێتەوەو خواش حەز لەچارەی بکا، تەوبەی لێ وەردەگرێت ، بۆنموونە: (ئەبوو سوفیان،

عیکرمە، سولەیم) وبڕێ تریان بڕوایان هێناو لێیان قەبووڵکرا ﴿والله علیم حکیم﴾ و خوا زۆر زانایە، زۆریش کارزان و کارجوانە.

**موسڵمان تاقیی دەکرێتەوە بە جیهاد:**

﴿[١٦] ام حسبتم ان تترکوا﴾ ئایا پێتان وایە – ئەی بڕواداران!–کە بێ تاقییکردنەوە دەرچن و، ڕاستگۆو درۆزن دەرنەکەوێ ؟ ﴿ولما یعلم الله الذین جاهدوا منکم﴾ کە – هێشتا لەپێش چاوخەڵکەوە – بۆخوا دەرنەکەوتووە موجاهیدتان ﴿ولم یتخذوا من دون الله ولا رسوله ولا المؤمنین ولیجة﴾ و ئەوانەشتان کەبەدەر لەخواو، لە پەیامبەرەکەی و، لە ئیمانداران ، کەسیان نەگرتووە بە جێی ڕازو نیازیان ، تا نهێنیەکانیان لابدرکێنن ﴿والله خبیر بماتعملون﴾ خۆ هەر کارێکیش بکەن خوا پێی بەئاگایە، کەوابوو جیهادو تەکلیف و ئەرك وواجیبات بۆدەرکەوتنی مرۆڤە سەر ڕاست ولاسارەکان شتێکی زەروورییە .

**لە موشریکان ئاوەدانکردنەوەی مزگەوت ناوەشێتەوە:**

لەوسەردەمەدا کاروباری مزگەوتی (حەرام) کەوتبووە لای موشریکەکان !خواش فەرمووی: ﴿[١٧] ماکان للمشرکین ان یعمروا مساجد الله﴾ بۆ خەڵکانی هاوبەشدانەر شیاوو ڕەوا نیە ئاوەدانکردنەوەی مزگەوتەکانی خوا ﴿شاهدین علی انفسهم بالکفر﴾ بۆ خۆشیان شایەتی بێباوەڕێتی خۆیان دەدەن ، کارو ڕەفتاریان هی بێ بڕوا و بت پەرستانە، واتە: بێ بڕوا لێی ناوەشێتەوە مزگەوت ئاوەدان بکاتەوە، بەتایبەتی خۆیشی هاوار بکات و بڵێ: من عەلمانیم، یان بە دەوری کەعبەدا بسووڕێتەوەو بڵێت: (لبیك لا شریك لك، إلا شریکا هو لك، تملکه وما ملك) ﴿اولئك حبطت اعمالهم﴾ بۆهەمیشە کاروکردەوەی ئەمانە پووچە ﴿وفی النار هم خالدون﴾ و بەردەوامیش لەئاگردان ﴿[١٨] إنما یعمر مساجد الله من آمن بالله والیوم الآخر﴾ بە ڕاستیی هەر بەوکەسە دەکەوێ مزگەوتەکانی خوا ئاوەدان بکاتەوە کە بڕوای بەخواو بە ڕۆژیی دوایی هەیە ﴿واقام الصلاة وآتی ازکاة﴾ و بەجوانیی و دروست هەڵدەسێ بە ئەنجامدانی نوێژو زەکات دەدات ﴿ولم یخش إلا الله﴾ و لە خواش نەبێت لە هیچ کەسێ ترسی نییە ﴿فعسی اولئك ان یکونوا من المهتدین﴾ بێگومانبن ئەوانە – ئەوکردەوە چاکانە دەکەن– لە ڕیزی شارەزا کراواندان .(ئیبن عەبباس) دەڵێ: هەموو وشەیەکی (عسی) لەقورئاندا، مانای (واجب) دەگەیەنێت، بۆنموونە: خوا کە بە پێغەمبەرمان (موحەممەد) ﷺ دەفەرموێ: (عسی أن یبعثك ربك مقاما محمودا) مانای وایە بێ شك و گومان (مەقامەلمەحموود)ی دەداتێ.(ئەبوحەییان) یش هەروا دەڵێت، ئەمەیە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: هەرکە پیاوێکتان دیت هۆگری مزگەوت بوو، ئێوە شایەتی ئیمانی بۆ بدەن، چونکە خوا دەفەرموێ: (إنما یعمر مساجدالله..) مسند الإمام أحمد.

الجزء العاشر — سورة التوبة

قَٰتِلُوهُمۡ يُعَذِّبۡهُمُ ٱللَّهُ بِأَيۡدِيكُمۡ وَيُخۡزِهِمۡ وَيَنصُرۡكُمۡ عَلَيۡهِمۡ وَيَشۡفِ صُدُورَ قَوۡمٖ مُّؤۡمِنِينَ ﴿١٤﴾ وَيُذۡهِبۡ غَيۡظَ قُلُوبِهِمۡۗ وَيَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَىٰ مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١٥﴾ أَمۡ حَسِبۡتُمۡ أَن تُتۡرَكُواْ وَلَمَّا يَعۡلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ مِنكُمۡ وَلَمۡ يَتَّخِذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَا رَسُولِهِۦ وَلَا ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَلِيجَةٗۚ وَٱللَّهُ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴿١٦﴾ مَا كَانَ لِلۡمُشۡرِكِينَ أَن يَعۡمُرُواْ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ شَٰهِدِينَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِم بِٱلۡكُفۡرِۚ أُوْلَٰٓئِكَ حَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡ وَفِي ٱلنَّارِ هُمۡ خَٰلِدُونَ ﴿١٧﴾ إِنَّمَا يَعۡمُرُ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ مَنۡ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَلَمۡ يَخۡشَ إِلَّا ٱللَّهَۖ فَعَسَىٰٓ أُوْلَٰٓئِكَ أَن يَكُونُواْ مِنَ ٱلۡمُهۡتَدِينَ ﴿١٨﴾ ۞أَجَعَلۡتُمۡ سِقَايَةَ ٱلۡحَآجِّ وَعِمَارَةَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ كَمَنۡ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَجَٰهَدَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ لَا يَسۡتَوُۥنَ عِندَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٩﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ أَعۡظَمُ دَرَجَةً عِندَ ٱللَّهِۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَآئِزُونَ ﴿٢٠﴾

١٨٩

**ئاو بەحاجی بەخشین و چاودێری کابە، وەکو ئیمان و جیهاد نین:**

﴿[١٩] **اجعلتم سقاية الحاج وعمارة المسجد الحرام**﴾ ئایا پێتان وایە ، ئاودان بەحاجیەکان و ئاوەدانکردنەوەی مزگەوتی (حەرام)تان ﴿**کمن آمن بالله واليوم الآخر وجاهد في سبيله**﴾ وەك كاری ئەوانە وایە بڕوای بەخواو بەڕۆژی دوایی هێناوەو جیهادی کردووە لە ڕێگەی خوادا ؟!. موشریکەکان بەوجۆرە کارانە خۆیانیان هەڵدەکێشاو کەش وفشیان دەکرد بەسەرموسڵمانەکاندا !خوای گەورەیش بەوئایەتە رەتی دانەوەو پێی گوتن: هەرگیز ئەو کارانە ناگەنە پلەی ئیمان وجیهادکردنی موسڵمانەکان، وەکو دەفەرموێ: ﴿**لا يستوون عند الله**﴾ ئەو دوانە "بڕوادارو بێ بڕوا" لای خوا یەکسان نین، کاری موشریکەکان کاریان بێهوودەیەو، موسڵمانەکانیش کاریان پیرۆزو پڕپیتە ﴿**والله لايهد القوم الظالمين**﴾ و خواش ڕێنمایی خەڵکانی ستەمکار ناکات بۆ کاری خێرو چاك، بۆیە ئاودان بەحاجیەکان و ئاوەدان کردنەوەی مزگەوتی حەرام بەباشتر دادەنێن لەئیمان وجیهاد ﴿[٢٠] **الذين آمنوا وهاجروا**﴾ ئەو کەسانەی باوەڕیان هێناو لەزێدی خۆیان کۆچیان کرد ﴿**وجاهدوا في سبيل الله بأموالهم وانفسهم**﴾ و لەڕێگەو ڕێبازی خوا - بەماڵ و سامان و گیانیان- جیهادیان کرد ﴿**اعظم درجة عند الله**﴾ بەلای خواوە پایەو پلەیان مەزنترو بەرزترە، لە وانە کە بەخەیاڵی خۆیان ئاو دەدەن بە دەم حاجییەکانەوەو مزگەوتەکان پاك وخاوێن دەکەن وموشریکیشن ﴿**واولئك هم الفائزون**﴾ هەر ئەوانەش بەختیارو سەرفرازن ﴿[٢١] **يبشرهم ربهم برحمة منه ورضوان**﴾ پەروەردگاریشیان مژدەی میهرەبانیی و ڕەزامەندیی مەزنی خۆیانی دەداتێ ﴿**وجنات لهم فيها نعيم مقيم**﴾ و چەند باخ و بێستانیکی واشیان دەداتێ، کە تێیدا گوزەران و نیعمەتی نەبڕاوەیان بۆ دەبێ ﴿[٢٢] **خالدين فيها ابدا**﴾ بە هەتا هەتاییش لەوێ دەبن ﴿**إن الله عنده اجر عظيم**﴾ بێگومان خوا پاداشی زۆر گەورەی لایە بۆ بڕواداران .

الجزء العاشر — سورة التوبة

يُبَشِّرُهُمْ رَبُّهُم بِرَحْمَةٍ مِّنْهُ وَرِضْوَٰنٍ وَجَنَّٰتٍ لَّهُمْ فِيهَا
نَعِيمٌ مُّقِيمٌ ﴿٢١﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥٓ أَجْرٌ
عَظِيمٌ ﴿٢٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّخِذُوٓا۟ ءَابَآءَكُمْ
وَإِخْوَٰنَكُمْ أَوْلِيَآءَ إِنِ ٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْكُفْرَ عَلَى ٱلْإِيمَٰنِ ۚ
وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٣﴾ قُلْ إِن
كَانَ ءَابَآؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ وَإِخْوَٰنُكُمْ وَأَزْوَٰجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ
وَأَمْوَٰلٌ ٱقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَٰرَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَٰكِنُ
تَرْضَوْنَهَآ أَحَبَّ إِلَيْكُم مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَجِهَادٍ
فِى سَبِيلِهِۦ فَتَرَبَّصُوا۟ حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى
ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٢٤﴾ لَقَدْ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ فِى مَوَاطِنَ
كَثِيرَةٍ ۙ وَيَوْمَ حُنَيْنٍ ۙ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ فَلَمْ
تُغْنِ عَنكُمْ شَيْـًٔا وَضَاقَتْ عَلَيْكُمُ ٱلْأَرْضُ
بِمَا رَحُبَتْ ثُمَّ وَلَّيْتُم مُّدْبِرِينَ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ أَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ
عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَأَنزَلَ جُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا
وَعَذَّبَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٢٦﴾

١٩٠ — ثُمُن

**موشریکان مەکەنە دۆس ، ئەر خزمی نزیکیش بن:**

﴿[٢٣] **يا ايها الذين آمنوا**﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! ﴿**لا تتخذوا آباءكم وإخوانكم أولياء إن استحبوا الكفر على الإيمان**﴾ ئەر باوو باپیران و براکانتان کوفریان لا باشترو چاکتربوو لەئیمان و باوەڕ، مەیانکەنە دۆستی خۆتان و خۆشەویستی و پەیوەندیتان بۆیان نەبێ ﴿**ومن يتولهم منكم**﴾ وهەرکەسێکتان ئەوانەی خۆشبوێ و بیانکاتە دۆست و(بطانة)ی خۆی ﴿**فأولئك هم الظالمون**﴾ دیارە ئەو جۆرە کەسانە ستەمکارن. (ئیبن عەباس) ئەڵێ: دەبنە موشریك و هاوبەشدانەر بۆ خوا . بەڵێ: حوکمی ئەم ئایەتە تا ڕۆژی قیامەت بەردەوامەو، دەبێ تەواوی موسڵمانان تەنهاو تەنها بۆ خوا خۆشەویستی و (موالات)یان هەبێ و، هەر لەگەڵ ئەهلی خوادا بن ﴿[٢٤] **قل إن كان آباؤكم**

وأبناؤكم وإخوانكم وأزواجكم وعشيرتكم﴾ پێیان بڵێ: ئەی موحەممەد ﷺ: ئەر باوك و كوڕو براو، ژن و خێزان و كۆمەڵ و خێڵ و خزمانتان ﴿وأموال اقترفتموها﴾ و ماڵ و سامانێك پەیداتان كردووە ﴿وتجارة تخشون كسادها﴾ و بازرگانییەك دەترسن ڕەواجی نەمێنێ ﴿ومساكن ترضونها﴾ و مەسكەن و خانوو بەرەیەك خۆشتان دەوێن ﴿احب إليكم من الله ورسوله وجهاد في سبيله﴾ هەریەك لەمانەتان لەخواو لەپەیامبەرەكەی ولە جیهادو تێكوشان لە ڕێی خوادا لا خۆشەویست تر بێ ﴿فتربصوا﴾ چاوەڕوان بن ﴿حتى يأتي الله بأمره﴾ هەتا فەرمان لە خواوە بەسزاتان بۆ دێ ﴿والله لا يهدي القوم الفاسقين﴾ خوایش ڕێنمایی لە شەرع دەرچوان ناكات بۆ هیچ خێرو چاكەیەك. بەڵێ پێغەمبەر ﷺ كاتێ فەرمانی بە هیجرەت و باركردن لە مەككەوە بۆ مەدینە دا، خەڵك كەوتە مەشۆرەت بەیەكتریی، هی وایان هەبوو ژنەكەی، یان كوڕەكەی، یان هەرخزم و كەس و كارێكی نزیكی.. دەستە دامێنی دەبوو بار نەكاو نەچێت بۆمەدینە ، ئەوسا ئەو ئایەتەی سەرەوە هات بەوشێوەیە ئاراستەی كردن. ئیمامی ئەحمەدو ئەبوداود ئەم فەرموودەی پێغەمبەرە دێنن : ((إذا تبايعتم بالعينة وأخذتم بأذناب البقر ورضيتم بالزرع وتركتم الجهاد سلط الله عليكم ذُلاً لاينْزِعُهُ حتى ترجعوا إلى دينكم)) واتە: هەركات كڕین وفرۆشتنتان بە فێڵ وفەرەج بوو و دەستان گرت بەكلكی گاكانەوە (واتە: بە جووت و كشت و كاڵ و مەزراوەوە سەرقاڵبوون) و، وازتان لەجیهاد هێنا، خواش ریسواتان دەكا، مەگەر بگەڕێنەوە بۆلای دینەكەتان.

**سەركەوتن هەر لای خوایە :**

﴿[٢٥] لقد نصركم الله في مواطن كثيرة﴾ بێگومان خوا لەگەڵ جێگادا هاوكاریی كردن و یاریدان و سەریخستن، لەگەڵ كەم وكورتیی و ناتەواویتاندا ﴿ويوم حنين﴾ بەتایبەتی لەڕۆژی (حونەین)دا. (حونەین: دۆڵێكە دەكەوێتە نێوان مەككەو تایەف)ەوە. بەهۆی لەخۆبایی بوونتانەوە تێكشكان و خوا هات بەهاناتانەوە، وەكو دەفەرموێ: ﴿إذ اعجبتكم كثرتكم﴾ ئەو دەمەی كە بەزۆری خۆتان بایيبوون و نازییتان و، بیرتان لەدەسەڵاتی خوا نەكردەوەو گوتتان: هەرگیز ئەمڕۆ بەم ژمارە زۆرەوە "كە ئاماری دەگەیشتە دوازدە هەزاركەس" ناشكێین! ئەگەرچی ئەوان چواردە هەزار كەسبوون، وەكو ئیمامی (بەیهەقیی) ریوایەتی دەكات ﴿فلم تغن عنكم شيئا﴾ كەچی ئەو حەشامەتە هیچ كەڵك و سوودی پێ نەگەیاندن و هەر تێكشكان ﴿وضاقت عليكم الأرض بما رحبت﴾ زەویش بەو گوشادو فراوانییە لەترساندا تەنگ بوو لێتان ﴿ثم وليتم مدبرين﴾ پاشانیش پاشە كشەتان كردو هەڵهاتن! واتە: سەركەوتن تەنها لە دەستی خوادایە، بەزۆریی و كەمی دوژمن نییە، بۆیە دەبێ هەموو كات خوامان لەبیر بێت ﴿[٢٦] ثم انزل الله سكينته على رسوله و على المؤمنين﴾ دوایی ئارامیی و ئۆقرەی ناردە سەردڵ و دەروونی پەیامبەرەكەیی و، بڕوادارەكان، هێزی دەروونییان بۆ گەڕایەوەو ترسیان نەما ﴿وانزل جنودا لم تروها﴾ و لەشكرێكی زۆریشی نارد بۆهاوكاریتان و، نەشتاندین ﴿وعذب الذين كفروا﴾ و بێ باوەڕەكانیشی سزادا، كوژران و دیلكران و سامانیان لەدەست دا ﴿وذلك جزاء الكافرين﴾ هەرئاوایە سزای كافران و بێ باوەڕان ﴿[٢٧] ثم يتوب الله من بعد ذلك على من يشاء﴾ دوای ئەوسزایەش حەزی لەچارەی هەركەسێك كردو بەشیاوی زانی، تەوبەی لێوەرگرت و لێیبووراو شارەزای دینی ئیسلامی كرد ﴿والله غفور رحيم﴾ و چوون خوا بۆخۆی زۆر لێبوردەیە، زۆریش دلۆڤان و میهرەبانە. بەڵێ ڕووداوەكەی (حونەین) ڕۆژی شەممە، (٦)ـی مانگی شەوالی ساڵی (٨)ـی كۆچیی، بە(١٩) ڕۆژ پاش فەتحی مەككە ڕوویدا، پێغەمبەر ﷺ بەخۆیی و(١٢) هەزار كەسەوە لەمەككە چوونە دەرێ، شیاوی باسە (٢) هەزاریان لە موسڵمانە نوێیەكان بوون و، نەشارەزای جەنگ بوون، هۆی جەنگەكەش زۆرێكی زۆرینەی عەشیرەت و هۆزەكان

رووبەروو وەستان و خۆیان ئامادەی پەلامارێك كردبوو، دەرئەنجام لەسەرەتاوە موسڵمانەكان بەشێوەیەكی سەیرو سەمەرە تێكشكان و، لەو (١٢) هەزار كەسەیە تەنها (١٠٠) كەسیان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ مانەوە، ئەمیش هاواری زۆری لێدەكرن بگەڕێنەوە، بەڵام كار لەكار ترازابوو و ئاوڕیان نەدایەوە! ئەوجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوایە! دەسا یارمەتیمان بۆ بنێرە، پاشان فەرمانیدا بە(عەباس)ی مامی كە یەكە یەكە هەڵهاتووەكان بەناوی خۆیانەوە بانگ بكاتەوە، ئەوانیش كە زانیان پێغەمبەر ﷺ گۆرەپانەكەی چۆڵ نەكردووەو هەردەڵێت: (انا النبی لا كذب * انا ابن عبدالمطلب) تیپ تیپ و پۆل پۆل گەرانەوەو جەنگ گەرم بوو، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((الآن حمی الوطیس)) وائێستا جەنگ گەرم بوو، ئیتر لامشتێ خۆڵی هەڵگرت وهاویشتیە نێو كافرەكانەوەو، هەریەكەیان بەشی خۆی بەركەوت و لێڵایی هات بەسەر چاویا، لەئەنجامدا پاش چەند كاتژمێرێك خوا نەناسەكان تێكشكان و موسڵمانەكان سەركەوتن و ئەو چەند ئایەتەش لەسەرەوە خوێنرانەوە هاتە خوارێ. والحمدلله رب العالمین.

ثُمَّ يَتُوبُ ٱللَّهُ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٧﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِنَّمَا ٱلْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ فَلَا يَقْرَبُوا۟ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ بَعْدَ عَامِهِمْ هَٰذَا ۚ وَإِنْ خِفْتُمْ عَيْلَةً فَسَوْفَ يُغْنِيكُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦٓ إِن شَآءَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٢٨﴾ قَٰتِلُوا۟ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ ٱلْحَقِّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ حَتَّىٰ يُعْطُوا۟ ٱلْجِزْيَةَ عَن يَدٍ وَهُمْ صَٰغِرُونَ ﴿٢٩﴾ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ عُزَيْرٌ ٱبْنُ ٱللَّهِ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَى ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ ٱللَّهِ ۖ ذَٰلِكَ قَوْلُهُم بِأَفْوَٰهِهِمْ ۖ يُضَٰهِـُٔونَ قَوْلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَبْلُ ۚ قَٰتَلَهُمُ ٱللَّهُ ۚ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٣٠﴾ ٱتَّخَذُوٓا۟ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَٱلْمَسِيحَ ٱبْنَ مَرْيَمَ وَمَآ أُمِرُوٓا۟ إِلَّا لِيَعْبُدُوٓا۟ إِلَٰهًا وَٰحِدًا ۖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٣١﴾

١٩١

**ڕێ بەموشریك نادرێ بچێتە مزگەوتی ( حەرام )ـەوە:**

﴿[٢٨] یاایها الذین آمنوا﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! ﴿إنما المشركون نجس﴾ چاك بزانن هەرچی هاوبەشدانەرو موشریكە ناپاك و پیسن لەبیروباوەڕو نیەتیاندا، لە باوو نەریتیاندا ﴿فلا یقربوا المسجد الحرام بعد عامهم هذا﴾ جا دوای ئەمساڵەیان (ساڵی نۆیەمی كۆچیی) نابێ نزیكی (كابە) ببنەوە، ئەمە ئەو ساڵەبوو كە (ئەبووبەكر) رضي الله عنه حەجی پێكردن و سوورەتی (بەرائە)یش هات ﴿وان خفتم عیلة﴾ خۆ ئەگەر لەهەژاری دەترسان، بەنەهاتنی ئەوان بۆ كرین و فرۆشتن بۆ بازاڕەكانی مەككە ﴿فسوف یغنیكم الله من فضله إن شاء﴾ دڵنیابن ئەگەر خوا بیەوێ لەرۆزی خۆی دەوڵەمەندتان دەكا، واتە: دەرگایەكی ترتان بۆ دەكاتەوە وگوزەرانتان باش دەكات ﴿إن الله علیم حكیم﴾ چوون بە ڕاستیی خوا زانایە، لەكارزان و كار جوانە، كەوابوو حەرامە موشریكان بچنە مزگەوتی(حەرام). دیارە گومانیش نییە كە هەرگیز نابێ خانوو بەرەیشی تیا دروست بكەن، وەدەبێ لە نیوەدورگەی عەرەبییدا وەكو (مەككە، مەدینە، یەمامە، یەمەن)و دەورو بەریان دەر بكرێن، مەگەر بە ڕێبواری هاتووچۆ بكەن ، وەك لەفەرموودەدا هاتووە ((اخرجوا المشركین من جزیرة العرب)) ﴿[٢٩] قاتلوا الذین لا یؤمنون بالله ولا بالیوم الآخر﴾ لەگەڵ ئەوانەشدا بجەنگێن "ئەی بڕواداران" كە بەخواو، بە ڕۆژی دوایی بێ باوەڕن ﴿ولا یحرمون ماحرم الله ورسوله﴾ و هەر شتێكیش خواو پەیامبەرەكەی ئەو حەرامیان كردبێ، ئەمان بە حەڵاڵ و ڕەوای دادەنێن ﴿ولا یدینون دین الحق﴾ و ملكەچی ئەم دین و ئایینە هەقەش نابن، كە تەنها ئەو دینەش ڕاست و دروستە". ﴿من الذین أوتوا الكتاب﴾ ئەوانەش دەبێ ئەوجەنگەیان لەگەڵ بكرێت ، خاوەن كتێب نامەكانن، موسایی و عیسایین ﴿حتی یعطوا الجزیة عن ید﴾ جەنگیان

لەگەڵ بکەن هەتا بەدەستی خۆیان سەرانە دەدەن ﴿وهم صاغرون﴾ و ملکەچ دەبن بۆ شەرعی پیرۆزی ئیسلام ، واتە: ملکەچی فەرمانی خوا دەبن و لەژێر رکێفی ئیسلامدا باجوو سەرانەی خۆیان دەدەن ودەژین ، ئیمامی شافیعی دەڵێ: باج وسەرانە تەنها لە ئەهلی کتێب و خاوەننامەکان وەردەگیردرێ.

**سەرنجێك:** هەرمووسایی و عیساییەك باوەڕی بە موحەممەد ﷺ نەبێ، مانای وایە بەسەرجەم پێغەمبەران باوەڕی نیەو، پەیڕەوی لەهەواو نەفس و ئارەزووی خۆی دەکا، نەك لە تەورات و ئینجیل، چونکە لەواندا هاتووە: دەبێ باوەڕ بە (موحەممەد) بێنن، هەر لەبەر ئەوەش بوو بڕیاری جەنگی لەگەڵدان. شیاوی باسە ئەم ئایەتە ساڵی نۆیەمی کۆچی و پاش سەقامگیربوونی نیوە دوورگەی عەرەبی هات بۆ فەرمان بەجەنگ لەگەڵ خاوەن نامەکاندا، بۆیە پێغەمبەر ﷺ لەمەدینەو لەدەوروبەری مەدینە (٣٠) هەزار کەسی کۆکردەوە بۆ هێرش بردنە سەر (رۆم)ـەکان .

**تێبینی:** سەرانە بڕیارێکی خوایی یە لەبەر پاراستنی ئەمن و ئاسایشی نیشتمان و پێشکەشکردنی پرۆژە خزمەت گوزاریەکانەوە دەبێ نێرینەی باڵغ و ئاقڵ و فامیدەو دەست ڕۆیشتوو ئەو سەرانە بدا، وەکو موسڵمانەکان زەکات دەدەن و دەچنە سەربازیی و، پارەو پولێکیان لێ دەسەنرێت لەبەرامبەر پرۆژە خزمەت گوزاریەکانەوە، خۆئەگەر ئەوانیش چوونە ژێر تەکلیفی پرۆژە خزمەتگوزاریەکانەوەو سەربازیان کرد، ئەوکات سەرانەکەیان لەکۆڵ دەکەوێ.

**جوولەکە (عوزەیر) دەکەنە کوڕی خوا، فەلەش عیسا!:**

﴿[٣٠] وقالت اليهود عزير ابن الله﴾ جوولەکە وتیان : (عوزەیر) کوڕی خوایە ! ﴿وقالت النصارى المسيح ابن الله﴾ فەلەکانیش - پاش عیسا بە سێ سەدە- وتیان: مەسیح (واتە:عیسا) کوڕی خوایە ! کەوابوو جەنگیان لەگەڵ بکەن، چونکە کافرو موشریکن ﴿ذلك قولهم بأفواههم يضاهئون قول الذين كفروا من قبل﴾ ئەو قسەیەشیان کەهەر بەزار دەیکەن لە قسەی کافرەکانی پێش خۆیان دەچێ، موشریکەکان دەیانگوت:(لات، عوززا، مەنات) خوامانن ودەیانپەرستین، ئەمانیش (عوزەیر) و (عیسا) بەخوا دەزانن !﴿قاتلهم الله انى يؤفكون﴾ بەر نەفرینی خوابکەون ، چۆن ئاوا لەهەق خۆکلا دەکەن؟﴿[٣١] اتخذوا احبارهم ورهبانهم أربابا من دون الله﴾ لە بری خوا مەلاو رەبەنەکانی خۆیانیان کردە خوا ! واتە: حەرامیان بۆ حەڵاڵکردن، وەکو ئەو فەرموودەیە- ترمزی لەعەدیەوە- لە سەر زاری پەیامبەر ﷺ دەیگێڕێتەوەو دەڵێ: خاچێکم لەملدا بووو چوومە خزمەتی پێغەمبەر، کەمنی دیت ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (إتخذوا احبارهم ورهبانهم..) پاشان (عەدیی)گوتی خۆ ئەوان: سوژدە بۆمەلاو رەبەنەکانیان نابەن، بەڵکو دەسکاری حەڵاڵ و حەرامیان بۆدەکەن ﴿والمسيح ابن مريم﴾ و فەلەکانیش عیسای کوڕی مەریەمیان کردە خوا ! ﴿وما امروا إلا ليعبدوا إلها واحدا﴾ خۆ وا فەرمانیشیان پێدرابوو کە: دەبێ هەر خوای تاك و تەنیا بپەرستن ﴿لا إله إلا هو﴾ کە جگە لەخۆی هیچ پەرستراوێکی تر بە هەق نیە ﴿سبحانه عما يشركون﴾ خوا لەوشتانە پاك وبێخەوشە بێ باوەڕەکان دەیکەنە هاوتاو هاوبەشیی.

**خاوەننامەکان گەرەکیانە نووری ئیسلام بکوژێننەوە:**

﴿[٣٢] يريدون ان يطفئوا نورالله بأفواههم﴾ ئەیانەوێ بە فووی دەمیان نوورو رۆشنایی خوا" ئایینی ئیسلام" بکوژێننەوە" بە بلاوکردنەوەی پروپاگەندەو ڕێگرتنی خەڵك لێی ﴿ويأبى الله إلا ان يتم نوره﴾ خۆ خوایش ئەیەوێ هەر ئەم نوورو رۆشنایی ئایینی خۆیە هەبێ و، بە پایانی بگەیەنێت و سەربیخات ﴿ولو كره الكافرون﴾ ئەگەرچی بێ باوەڕەکانیش پێیان ناخۆش بێت ﴿[٣٣] هو الذى ارسل رسوله بالهدى ودين الحق﴾ هەر ئەوخوایە خۆیەتی،

پەیامبەری خۆی نارد بەڕێ نیشاندەری ئایین و ڕێبازی حەق و حەقیقەت ﴿ليظهره على الدين كله﴾ بۆ ئەوە بەسەر گشت ئایینەکانی تردا زاڵیکات، وەکو ئەم فەرمووده رەوانە هاتووەو دەفەرموێ: (إن الله زوى لى الأرض مشارقها ومغاربها، وسيبلغ ملك أمتى مازوى لى منها) واتە: خوا خۆرهەلآت و خۆرئاوای ڕووی زەوی پێچایەوە بۆم – وەکو نەخشە – هێنرایە پێش چاوم ودیتم، پاشان فەرمووی: ڕۆژێ دێتە پێش ئوممەتی من تەواوی ئەو شوێنانە – لەم نەخشەیەدا بۆم تۆمار کراوە – دەگرێتە دەست. ﴿ولو كره المشركون﴾ ئەگەر چی هاوبەشدانەرەکانیش حەز نەکەن وپێیان خۆش نەبێت.

**لەزانای خراپ و، عابیدی نەزان دووربکەرەوە:**

سُورَةُ التَّوبَةِ الجُزءُ العَاشِرُ

يُرِيدُونَ أَن يُطْفِـُٔواْ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفْوَٰهِهِمْ وَيَأْبَى ٱللَّهُ إِلَّآ
أَن يُتِمَّ نُورَهُۥ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٣٢﴾ هُوَ ٱلَّذِىٓ
أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ
كُلِّهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُشْرِكُونَ ﴿٣٣﴾ ۞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُوٓاْ إِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْأَحْبَارِ وَٱلرُّهْبَانِ لَيَأْكُلُونَ
أَمْوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلْبَٰطِلِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۗ
وَٱلَّذِينَ يَكْنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلْفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا
فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣٤﴾ يَوْمَ يُحْمَىٰ
عَلَيْهَا فِى نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكْوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمْ وَجُنُوبُهُمْ
وَظُهُورُهُمْ ۖ هَٰذَا مَا كَنَزْتُمْ لِأَنفُسِكُمْ فَذُوقُواْ مَا كُنتُمْ
تَكْنِزُونَ ﴿٣٥﴾ إِنَّ عِدَّةَ ٱلشُّهُورِ عِندَ ٱللَّهِ ٱثْنَا عَشَرَ
شَهْرًا فِى كِتَٰبِ ٱللَّهِ يَوْمَ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ
مِنْهَآ أَرْبَعَةٌ حُرُمٌ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ ۚ فَلَا تَظْلِمُواْ فِيهِنَّ
أَنفُسَكُمْ ۚ وَقَٰتِلُواْ ٱلْمُشْرِكِينَ كَآفَّةً كَمَا
يُقَٰتِلُونَكُمْ كَآفَّةً ۚ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٣٦﴾

١٩٢ إِنَّمَا ٱلنَّسِىٓءُ

﴿[٣٤] يا أيها الذين آمنوا إن كثيرا من الأحبار والرهبان﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ! بێ سۆ بەشی زۆری فرەزانەکانی جوولەکەو، گۆشەگیرو رەبەنی فەلەکان ﴿ليأكلون أموال الناس بالباطل﴾ بە تالآن و هەوانتە ماڵ و سامانی مەردوم دەخۆن ﴿ويصدون عن سبيل الله﴾ و ڕێی خوایشیان لێ دەگرن و، ناهێڵن دینی ئیسلام قەبووڵکەن !! (ئیبن کەسیر) دەڵێ: مەبەست لە زانا خراپەکان و، خواپەرستە گومڕاکانیانە، وەکو (سوفیانی کوڕی عویەینە)ش لەبارەی هەموو زانایەکی خراپ وسەرگەردانەوە ئەڵێت:(من فسد من علمائنا كان فيه شبه من اليهود، ومن فسد من عبادنا كان فيه شبه من النصارى)، واتە: هەر زانایەکمان– زەڕەی خۆی تاڵ کردو ڕەوشتی تێکچوو، دڵنیابن لێکچوانێکی بە(یەهوود)ـەوە هەیەو، بەشێ لەسیفەتی جوولەکەی تێدایە، هەر کەسیش لەعابیدەکانمان تێکچووو دەستی دایە خراپەکردن، دیارە ئەویش بەشێ لەسیفاتی فەلەو گاورەکانی تێدایە. (عەبدوڵڵای کوڕی موبارەك)یش لەم هۆنراوەیەدا چەند جوان دەڵێ: وهل أفسد الدين إلا الملوك * * * وأحبار سوء و رهبانها؟ . واتە: باشە! بەدەر لەپاشاو لە مەلا خراپەکان و، لەعابیدە رەبەنەکان، کێی تر (دین)ـی تێکدا ؟. ﴿والذين يكنزون الذهب والفضة﴾ ئەوانەش زێڕو زیوو کۆ ئەکەنەوە ﴿ولا ينفقونها فى سبيل الله﴾ و لە ڕێی خوادا بەختی ناکەن ﴿فبشرهم بعذاب اليم﴾ جا تۆش بەسزایەکی ئێش پێگەیەنەر مژدەیان بدەرێ ! ﴿[٣٥] يوم يحمى عليها فى نار جهنم﴾ ڕۆژێ کەئەو زێڕو زیوە لەناو ئاگردا سوور ئەکرێتەوەو گەرم ئەکرێ ﴿فتكوى بها جباههم و جنوبهم وظهورهم﴾ ئینجا نێو چاوو کەلەکەو پشتیانی پێداخ ئەکرێ و دەسوتێنرێ ﴿هذا ما كنزتم لأنفسكم﴾ و پێیان ئەوترێ: ئەمە ئەو زێڕو زیوەیە خڕتان کردەوە بۆ خۆتان و، بەختتان نەکرد بۆ ڕێی خوا! ﴿فذوقوا ما كنتم تكنزون﴾ دەسا سزاکەی بچێژن. بەڵێ بەخشینی ماڵ وسامان لەڕێی خوادا شتێکی سەرەکی وخاڵێکی گرنگە لەدینی ئیسلامدا، تەنانەتی پیاوێکی وەکو (ئەبووزەڕ) رای وایە کە زیاد لەنەفەقەی ماڵ

ومندالْ، کۆکردنەوەو دانانی هەر پارەو پولێك (لەبانق ولە هەرجێگایەکی تردا) قەدەغەو حەرامە، بۆیە چوو بەگژ (موعاویە)و (عوسمان)دا (خوا لێیان رازیی).

## سالْ دوانزە مانگە :

﴿[٣٦] إن عدة الشهور عند الله اثنا عشر شهرا فی كتاب الله یوم خلق السماوات والأرض﴾ بێگومان هەر ئەو ڕۆژە کەخوا دنیای داهێناو، ئاسمانەکان و زەویی دروستکرد، ژمارەی مانگەکانیشی لە(لەوحولمەحفوظ)دا بەدوازدە مانگ دانا، ئیتر بەگۆڕین و پاش و پێشکردنی خوانەناس و موشریکەکان ئەویاسایانە ناگۆڕدرێ ﴿منها أربعة حرم﴾ ئەم چوارەیان: (زیقەعـەدە، زیحەججە، موحەڕەم، ڕەجەب) ڕێزی تایبەتییان هەیەو جەنگیان تێدا حەرامە﴿ذلك الدین القیم﴾ ئەمە بڕیاری ڕاستەقینەی خوایە، ئالْ و گـۆڕ ناکرێ و، نابێ لە خۆتانەوە بچن جەنگیان تیابکەن ﴿فلاتظلموا فیهن أنفسكم﴾ دەسا ئێوەش لەومانگانەدا ستەم وناهەقیی لەخۆتان مەکەن، شەڕفرۆشییان تێدا مەکەن ﴿وقاتلوا المشركین كافة﴾ ئێوەش هەمووتان بە یەك دەست و بەگەلە کۆمەکی لەگەڵ هەموو موشریکاندا بجەنگن ﴿كمایقاتلونكم كافة﴾ هەرچۆنێ ئەوان بەیەکدەست لێتان دەدەن و جەنگتان لەگەڵدەکەن ﴿واعلموا أن الله مع المتقین﴾ چاکیش بزانن خوا لەگەڵ پارێزکاراندایە، هەرکەسیش خوای لەگەڵ بێت هەمیشە سەرکەوتوو ئەبێ.

## نابێ بڕیاری خوا دەسکاری بکرێ و بگۆڕدرێ:

﴿[٣٧] إنما النسیئ زیادة فی الكفر﴾ بێگومان ڕاگوێزان و دواخستنی حورمەتی مانگێك بۆمانگێکی ترو، ئالْ و گۆڕیان زیادکردنە لە کوفرو خوانەناسی. عەرەبەکان لەبەرئەوەی کە هەر خەریکی جەنگ و ئاژاوە بوون، هەندێ جار ئەو چوار مانگە قەدەغە کراوەیان دەگۆڕێ بۆ ئەومانگانە جەنگیان تێدا قەدەغە نەبوو، هەتا شەڕەکەیان حەڵاڵ بکەن، دیارە ئەم فڕت و فێڵ و خۆدزینەوە لەبڕیارەکانی خوا کوفرو زیاد کردن بوو لە کوفر ﴿یضل به الذین كفروا﴾ ئەو بێ باوەڕانەی پێگومڕا دەکرێ ﴿یحلونه عاما﴾ کە ساڵێ شەڕ لە مانگە قەدەغەکراوەکاندا حەڵاڵ دەکەن ﴿و یحرمونه عاما﴾ و ساڵێکیش یاساغی ئەکەن ﴿لیواطئوا عدة ما حرم الله﴾ هەتا بەو کارەیان ژمارەی ئەو چوار مانگەیە کەخوا شەڕی تێدا یاساغکردوون – لەگەڵ مانگە ڕەواکاندا – بەرامبەر بکەنەوە ﴿فیحلوا ما حرم الله﴾ ئیتر لەو ڕێگەوە ئەو مانگانەی کە خوا یاساغی کردوون حەڵاڵیان دەکەن ﴿زین لهم سوء أعمالهم﴾ کردەوەی خراپ و ناشیرینی خۆیانیان لاجوانکرا، بۆیە ئاوا ڕەفتار دەکەن ﴿والله لا یهدی القوم الكافرین﴾ هەرگیز خوا خەڵکانی بێ بڕوا شارەزاو ڕێنمایی ناکات بۆ ڕێی هەق و وەرگرتنی.

الجزء العاشر سورة التوبة

إِنَّمَا ٱلنَّسِىٓءُ زِيَادَةٌ فِى ٱلْكُفْرِ ۖ يُضَلُّ بِهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟
يُحِلُّونَهُۥ عَامًا وَيُحَرِّمُونَهُۥ عَامًا لِّيُوَاطِـُٔوا۟ عِدَّةَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ
فَيُحِلُّوا۟ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ ۚ زُيِّنَ لَهُمْ سُوٓءُ أَعْمَٰلِهِمْ ۗ وَٱللَّهُ
لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٣٧﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُوا۟ مَا لَكُمْ إِذَا قِيلَ لَكُمُ ٱنفِرُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱثَّاقَلْتُمْ
إِلَى ٱلْأَرْضِ ۚ أَرَضِيتُم بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا مِنَ ٱلْءَاخِرَةِ ۚ
فَمَا مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا فِى ٱلْءَاخِرَةِ إِلَّا قَلِيلٌ ﴿٣٨﴾
إِلَّا تَنفِرُوا۟ يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا وَيَسْتَبْدِلْ قَوْمًا
غَيْرَكُمْ وَلَا تَضُرُّوهُ شَيْـًٔا ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ
قَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ إِلَّا تَنصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ ٱللَّهُ إِذْ أَخْرَجَهُ
ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ثَانِىَ ٱثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِى ٱلْغَارِ إِذْ
يَقُولُ لِصَٰحِبِهِۦ لَا تَحْزَنْ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا ۖ فَأَنزَلَ
ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَيْهِ وَأَيَّدَهُۥ بِجُنُودٍ لَّمْ تَرَوْهَا
وَجَعَلَ كَلِمَةَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلسُّفْلَىٰ ۗ
وَكَلِمَةُ ٱللَّهِ هِىَ ٱلْعُلْيَا ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٤٠﴾

## بۆچی بۆ جیهاد نابزووتن؟:

﴿[٣٨] یاأیها الذین آمنوا مالکم إذا قیل لکم انفروا فی سبیل الله﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! چیتانە کەپێتان دەگوترێ: بچنە جیهاد لە ڕێی خوادا ﴿اثاقلتم إلی الأرض﴾ لەشگران وتەمەڵن و، بەزۆر خۆ دەنووسێنن بەزەوییداو، دوای پێغەمبەر ناکەون بۆخەزای (تەبووک) ﴿أرضیتم بالحیاة الدنیا من الآخرة﴾ ئاخۆ لەبەر ئەوەبێ کەژیانی ئەم دونیایەتان لە قیامەت پێ باشتربێ ؟ ﴿فما متاع الحیاة الدنیا فی الآخرة إلا قلیل﴾ جائەر لەبەر ئەوەبێت، خۆ ژیانی ئەم دونیایە لەچاو ژیان و گوزەرانی دوا ڕۆژ، شتێکی زۆرکەم و بێ بایەخە، پەیامبەریش ﷺ لەبارەی خۆ ئامادەکردنەوە بۆجیهاددەفەرموێ: ((من مات ولم یغز ولم یحدث به نفسه، مات علی شعبة من نفاق)) رواه مسلم.

﴿[٣٩] إلا تنفروا یعذبکم عذابا الیما﴾ ئەر گشت بەجارێ بەرەو مەیدانی جیهاد لەگەڵ پەیامبەردا ﷺ دەرنەچن، خوا سزایەکی ئێش پێگەیەنەرتان ئەداو، دوژمنیش زاڵ ئەکات بەسەرتانا ﴿ویستبدل قوما غیرکم﴾ ئێوە لادەباو خەڵکێکی تردەخاتە جێگاتان، ئەوجا ئەوان وەکو ئێوە نابن و، دیفاع لەپێغەمبەر دەکەن و، وەڵامی دەدەنەوە بۆجیهاد ﴿ولا تضروه شیئا﴾ خۆ بەدواکەوتنیشتان لەجیهاد ناتوانن بەرهەڵستی بووەستن و، هیچ جۆرە زیانێکی پێبگەیەنن ﴿والله علی کل شئ قدیر﴾ وە خواش بەسەر هەمووشتێکدا بەتوانایە، دەتوانێ لەناوتان ببات و، خەڵکێکی تر بهێنێتە جێگاتان، مەبەست لەم ئایەتە هەڵنانی موسڵمانەکانە بۆ جەنگی تەبووک و، ئەم ئایەتەی: (یاأیهاالذین..)ش سەبارەت بە دوا کەتووەکانی جەنگی (تەبووک) هاتە خوارێ. کەوابوو لەکاتی زەروورەت و پێویستدا دەبێ گشتتان دەرچن و ڕاپەڕن، چونکە ئامادەبوون بە ئەندازەی پێویست، کارێکی نووسراوو فەرزە.

### خوا بۆ خۆی پێغەمبەر ﷺ سەردەخات :

﴿[٤٠] إلا تنصروه فقد نصره الله﴾ ئەر ئێوە یارمەتی پەیامبەر نەدەن و، لەگەڵی نەچن بۆ جەنگی (تەبووک)، دڵنیابن خوا یارمەتی دەدا، هەر چۆن یارمەتیدا ﴿إذ اخرجه الذین کفروا﴾ ئەو دەمە کە بێ باوەڕەکان – لەمەککە- دەریان پەڕاندو، ناچاریان کرد کۆچ بکات بۆ مەدینە ﴿ثانی اثنین﴾ کە یەکێکبوو لە دوو کەسان، واتە: لەو دەمەدا کە تەنیا دوو کەسبوون، (پەیامبەر ﷺ و ئەبوو بەکر ﵁) جاخوا لەو کات وساتە تەنگەدا ئەبووبەکری کردە پاڵپشت وپشتیوان بۆی ﴿إذ هما فی الغار﴾ کە لە ئەشکەوتەکەی کێوی (سەور)دا بوون.

کێوی سەور: شاخێکە دەکەوێتە نزیک شاری مەککەوە، پێغەمبەرو هاوەڵەکەی لەوێ سێ ڕۆژ مانەوە، پاشان (٨)ی مانگی ڕەبیعی یەکەمی، ساڵی یەکەمی کۆچی، بەرامبەربە (٢٣ /٩ /٦٤٤) ز گەیشتنە مەدینەو، پێشوازیەکی گەرم وگوڕیان لێکرا، بەو شێوەیە لەکتێبەکانی تەفسیرو ژیننامەدا باسکراوە ﴿إذ یقول لصاحبه لا تحزن إن الله معنا﴾ کە لەو دەمەدا پەیامبەر ﷺ بە هاوڕێکەی خۆی (ئەبوو بەکر)ی دەگوت: خەمی منت نەبێ و، لەبەر من دڵ تەنگ مەبە، دڵنیابە خوا لەگەڵمانە، ئەمەش ئەو کاتەبوو کەبێ باوەڕەکان دوایان کەوتبوون و ئەوەندەش نزیکبووبوونەوە ئەر تەماشای بەرپێی خۆیانیان کردبا ئەمانیان دەدیت، بۆیە ئەبووبەکر لەگیانی پێغەمبەر ترساو بێ تاقەتبوو و، پەیامبەریش ﷺ فەرمووی: ترست نەبێ، چونکە خوا لەگەڵمانە ﴿فأنزل الله سکینته علیه﴾ ئینجا خوا ئارامیی و هێمنی و ئۆقرەی خۆی ناردە سەر ئەبووبەکر ﴿وأیده بجنود لم تروها﴾ وپێغەمبەریشی بە لەشکرێ – کە ئێوە نەتان دیت– لە فریشتەکان پشتگیری کرد ﴿وجعل کلمة الذین کفروا السفلی﴾ وە وشەو شیرکی موشریک وبێ باوەڕەکانیشی بن خست و تێکشکان ﴿وکلمة الله هی العلیا﴾ وە هەر وشەی خوا بەرزو بڵندە ، واتە: تەوحیدو یەکخواپەرستی، شیاوی ئاماژە بۆ کردنیشە تەنها جەنگێك بۆخوایەو پەسەندەلای، کە لەبەر بەرز ڕاگرتنی بڕیارو

ئەحکامەکانی خوا بێت، وەکو پێغەمبەری پێشەوامان دەفەرموێ: ((من قاتل لتكون كلمة الله هی العليا فهو فی سبیل الله)) متفق علیه. ﴿والله عزيز حكيم﴾ و خواش بۆ خۆی زۆر بەدەسەڵات و کارزان وکاردروستە.

### دەبێ گشت بچنە جیهاد:

ساڵی ڕووداوەکەی جەنگی (تەبووك)، خوای میهرەبان فەرمانددا بەگشت موسڵمانەکان کە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ ڕێ بگرنە بەرو بچنە غەزا دژی (ڕۆم)ـە خاوەننامە کافرەکان، ئەم فەرمانەشی فەرمانێکی حەتمی بوو و، خۆلادان نەبوو لێی! وەك دەفەرموێ: ﴿[41] إنفروا خفافا وثقالا وجاهدوا بأموالكم وانفسكم فی سبیل الله﴾ دەبێ گشتتان (سووکبارو گرانبار، پیرولاوو گەنج، ئازاو بەجەرگ، ترسنۆك و بێ ورە) بەماڵ و سامان، بەدڵ و بەگیان لەڕێی خوادا



جیهاد بکەن ﴿ذلكم خيرلكم إن كنتم تعلمون﴾ گەر بشزانن ئەوە قازانجتانەو، بۆتان چاکترە تاخۆ نوساندن بە زەوییداو، پێغەمبەریش لەتەبووك بێت.

### بیانووی دوو ڕووەکان:

ئینجا خوای پاشا حاڵی دووڕوو و دواکەوتووەکانی شەڕی (تەبووك) دەگێڕێتەوە کە: چۆن خۆیان و خەڵکیان پەشیمان دەکردەوە لەجیهاد، بۆیە دەفەرموێ: ﴿[42] لو کان عرضا قريبا وسفرا قاصدا﴾ خۆ ئەگەر ئەوەی بانگ کران بۆی لە(تەبووك) دەسکەوتێکی نزیك و سەفەرێکی بێ ڕەنج و بێ ماندوبوون بووبا ﴿لا تبعوك﴾ لەبەر ئەوە بەئاسان دوات ئەکەوتن و لەگەڵت دەردەچوون ﴿ولكن بعدت عليهم الشقة﴾ بەڵام ئەو مەودا دوورو نارەحەت و دژوارەیان لاگران وسەخت بوو، بۆیە بڕوو بیانوویەکی زۆریان هێنایەوەو ڕێیان بۆخۆ دزینەوە خۆشکرد ﴿وسيحلفون بالله﴾ بۆدواییش دێن بەخوا سوێند دەخۆن ودەڵێن: ﴿لو استطعنا لخرجنا معكم﴾ ئەر توانیبامان"واتە: ولاخ و داراییمان هەبووبا" لەگەڵتاندا دەر دەچووین بۆ خەزاکە ﴿يهلكون انفسهم﴾ بە هۆی ئەودرۆو دەلەسەوە خۆ لەناودەبەن ﴿والله يعلم إنهم لكاذبون﴾ خواش چاك دەزانێ درۆزنن ودرۆئەکەن ﴿[43] عفا الله عنك لم اذنت لهم﴾ خوا لێت خۆش بێ، بۆچی -بێ تاقیکردنەوە- مۆڵەتت بەدوو ڕووەکاندا نەیەن بۆ خەزاکەی تەبووك ؟ ﴿حتی يتبين لك الذين صدقوا﴾ ئیزنت نەدابان تا ئەوانەت بۆ دەردەکەوتن ڕاستیان دەکرد ﴿وتعلم الكاذبين﴾ ومونافق و درۆزنەکانیشت دەناسی ؟ ﴿[44] لا يستأذنك الذين يؤمنون بالله واليوم الآخر﴾ دڵنیابە ئەوانەی بڕوایان بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە، هیچکات نایەن داوای مۆڵەتت لێ بکەن بۆ دانیشتن و نەچوونە جیهاد، بەڵکوئەوان هەمووکات چاوەڕوانی فەرمانی تۆن ﴿ان يجاهدوا بأموالهم وانفسهم﴾ فەرمانیان پێبدەیت کەبە سامان و گیانیان جیهاد بکەن، چونکە ئەزانن خوا چ پاداشتێکی بۆ موجاهیدان دیاریکردووە ﴿والله عليم بالمتقين﴾ و خواش زۆر زانایە بەحاڵی خۆپارێزان ﴿[45] إنما يستأذنك الذين لا يؤمنون بالله واليوم الآخر﴾

هەمیشە هەر ئەوانە داوای مۆڵەتت لێدەکەن -نەچنەجیهاد- کەبڕوایان بەخواو بەڕۆژی دوایی نییە ﴿وارتابت قلوبهم﴾ و لەراستی دینی ئیسلامیشدا دوودڵن ﴿فهم فی ریبهم یترددون﴾ بەردەوامیش لە دوودڵی خۆیاندا سەرگەردانن و دەتلێنەوە.

## مرۆڤی دوو ڕوو درۆزن:

﴿[٤٦] ولو أرادوا الخروج لأعدوا له عدة﴾ ئەگەر بیان ویستایە لەگەڵت دەرچن بۆ جیهاد، چەك و توێشوو هەموو پێویستیەکیان بۆ ئامادە دەکرد ﴿ولکن کره الله انبعاثهم﴾ بەڵام چونکە خوا هاتنیانی پێخۆش نەبوو ﴿فثبطهم﴾ گرێی خستە بەردەمیان و، ورەیان نەماو پاڵیان لێدایەوە ﴿وقیل اقعدوا مع القعدین﴾ و پێیشیان گوترا: دەبچن لەگەڵ دانیشتوواندا، واتە: ژن و منداڵ و نەخۆش و پەککەوتەو نابیناکاندا بۆخۆتان دانیشتن! ﴿[٤٧] لو خرجوا فیکم مازادوکم إلا خبالا﴾ ئەگەر -ئەو دووڕووانە- دەریش چووبان لەگەڵتان بۆ مەیدانی جەنگ، دوودڵی و خراپەو گێرەشێوێنی نەبوایە خێرێکیان بۆزیاد نەدەکردن ﴿و لأوضعوا خلالکم﴾ بەپەلەش بەینتانیان تێکدەدا ﴿یبغونکم الفتنة﴾ چونکە هەمیشە دەیانەوێ فیتنەو ئاژاوەتان بۆبنێنەوە ﴿وفیکم سماعون لهم﴾ و لە نێو ریزەکانی ئێوەشدا کەسانێ وا هەیە قسەی ئەوانی قەبووڵەو، گوێیان بۆ دەگرێ و، هەواڵ و دەنگ و باستانیان بۆ دەبەن ﴿والله علیم بالظالمین﴾ خوا بۆخۆی دووڕووە ستەمکارەکان چاك دەناسێت، دەزانێ دڵیان چی تێدایە ﴿[٤٨] لقد ابتغوا الفتنة من قبل﴾ پێش ئێستاش (واتە: هەرلەسەرەتای هاتنتەوە بۆ مەدینە) هەرخەریکی فیتنە نانەوەو ئاژاوەن، لەجەنگی (ئوحود)یشدا (عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی) و دەستەو بەستەکەی هەوڵی زۆریاندا بۆ پەشیمانکردنەوەی هاوەڵان و، خەڵکێکیان لێگێڕانەوە! ﴿وقلبوا لك الأمور﴾ وەکاروباریان لێهەڵگێڕایتەوە، باتڵیانکردە هەق و، هەقیانکردە ناهەق! ﴿حتی جاء الحق وظهر امرالله﴾ هەتا ڕۆژێ کە هەق و ڕاستیی دەرکەوت و یارمەتی خواهات و، ئایینی ڕەوای خوێ سەرخست و خەڵکێکی زۆر بوونە موسڵمان، بەتایبەتی پاش بەدر ﴿وهم کارهون﴾ وئەوانیش- لەو سەرکەوتنە - ڕکیان دەبووەو پێیان ناخۆش بوو، بەڵام خوای گەورە هەر کاری خۆیکرد ﴿[٤٩] ومنهم من یقول ائذن لی ولا تفتنی﴾ لەنێو دووڕووەکاندا کەسی وایان هەیە بەپێغەمبەر دەڵێت: مۆڵەتم بدە ئەی موحەممەد! با بۆخۆم دانیشم و نەچمە خەزاو مەککەوە، نەوەك تووشی نارەحەتی و گوناح ببم! ئەم ئایەتە -وەك سیووتی ئەڵێ- ئەو حەلە هاتەخوارێ کە (جەددی کوڕی قەیس) بە مەبەستی خۆ دزینەوە وتی: من لە بەردەم جوانیی و شۆخ وشەنگی کچە ڕۆمییەکاندا توانای خۆ گرتنم نییەو دەترسم تووشی گوناح ببم، دەسا بەڵکو ئیزنم بدەیت نەیەم بۆخەزاکە! ﴿ألا فی الفتنة سقطوا﴾ بێداربن! هەر بەو قسەیە ئەوانە کەوتنە ناوهەمان فیتنەو



لَقَدِ ٱبۡتَغَوُاْ ٱلۡفِتۡنَةَ مِن قَبۡلُ وَقَلَّبُواْ لَكَ ٱلۡأُمُورَ حَتَّىٰ
جَآءَ ٱلۡحَقُّ وَظَهَرَ أَمۡرُ ٱللَّهِ وَهُمۡ كَٰرِهُونَ ﴿٤٨﴾
وَمِنۡهُم مَّن يَقُولُ ٱئۡذَن لِّي وَلَا تَفۡتِنِّيٓۚ أَلَا فِي ٱلۡفِتۡنَةِ
سَقَطُواْۗ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةُۢ بِٱلۡكَٰفِرِينَ
﴿٤٩﴾ إِن تُصِبۡكَ حَسَنَةٞ تَسُؤۡهُمۡۖ وَإِن تُصِبۡكَ
مُصِيبَةٞ يَقُولُواْ قَدۡ أَخَذۡنَآ أَمۡرَنَا مِن قَبۡلُ وَيَتَوَلَّواْ
وَّهُمۡ فَرِحُونَ ﴿٥٠﴾ قُل لَّن يُصِيبَنَآ إِلَّا مَا كَتَبَ
ٱللَّهُ لَنَا هُوَ مَوۡلَىٰنَاۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ
﴿٥١﴾ قُلۡ هَلۡ تَرَبَّصُونَ بِنَآ إِلَّآ إِحۡدَى ٱلۡحُسۡنَيَيۡنِۖ وَنَحۡنُ
نَتَرَبَّصُ بِكُمۡ أَن يُصِيبَكُمُ ٱللَّهُ بِعَذَابٖ مِّنۡ عِندِهِۦٓ
أَوۡ بِأَيۡدِينَاۖ فَتَرَبَّصُوٓاْ إِنَّا مَعَكُم مُّتَرَبِّصُونَ ﴿٥٢﴾ قُلۡ
أَنفِقُواْ طَوۡعًا أَوۡ كَرۡهٗا لَّن يُتَقَبَّلَ مِنكُمۡۖ إِنَّكُمۡ كُنتُمۡ
قَوۡمٗا فَٰسِقِينَ ﴿٥٣﴾ وَمَا مَنَعَهُمۡ أَن تُقۡبَلَ مِنۡهُمۡ نَفَقَٰتُهُمۡ
إِلَّآ أَنَّهُمۡ كَفَرُواْ بِٱللَّهِ وَبِرَسُولِهِۦ وَلَا يَأۡتُونَ ٱلصَّلَوٰةَ
إِلَّا وَهُمۡ كُسَالَىٰ وَلَا يُنفِقُونَ إِلَّا وَهُمۡ كَٰرِهُونَ ﴿٥٤﴾

تاقییکردنەوەو گوناح و تاوان ، چونکە هەربەو قسەیە ئەنجامی دوو ڕوویی و، ناپاکیان ئاشکرابوو و دەرکەوت کە مەبەست لەوگوتەیە خۆدزینەوەیە لە پەیامبەرﷺ ﴿وإن جهنم لمحيطة بالكافرين﴾ و بێگومان دۆزەخ دەورەی بێ باوەڕەکانی داوەو، قەت ڕزگاریان نابێ لێی ﴿٥٠ إن تصبك حسنة تسؤهم﴾ ئەر چاکەیەکت دەسکەوێت ، واتە: لە جەنگێکا سەرکەون– وەکو فەتحی ولاتی ڕۆم– گەلێ بێتاقەت دەبن و پێیان ناخۆشە ﴿وإن تصبك مصيبة﴾ خۆ ئەگەر بەلایەکت تووش ببێ و تێکبشکێن ﴿يقولوا قد أخذنا أمرنا من قبل﴾ ئەلێن: ئێمە هەر بەرلەمە ئیحتیاتی خۆمانمان وەرگرت و باشبوو نەچووینە خەزاکە، هەتا ئێمەیش تووشی ئەم تێکشکانە ببین ﴿ويتولوا وهم فرحون﴾ بەدڵشادیی و خۆشحاڵیەوە پشت لە پێغەمبەر ﷺ دەکەن و دەچن بەرێی خۆیاندا، ئینجا خوا وەلامی جەرگبڕیان ئاراستەی پێغەمبەر دەکا، بۆیە دەفەرموێ: ﴿٥١ قل لن يصيبنا إلا ما كتب الله لنا﴾ بلێ:–ئەی پێغەمبەرﷺ– قەت شتێکمان تووش نایە، خوا خۆی لە(لوح المحفوظ)دا بڕیاری نەدابێ بۆمان ﴿هو مولانا﴾ هەر ئەویش بۆخۆی گەورەو سەروەرمانە ﴿وعلى الله فليتوكل المؤمنون﴾ موسڵمانان دەبێ پشت وپەنایان هەرخوا بێت ﴿٥٢ قل هل تربصون بنا إلا إحدى الحسنيين﴾ بلێ: ئاخۆ ئێوە جگە لەیەکێ لەو دوو کارە زۆر چاك و پیرۆزانە– یان سەرکەوتن بەسەر ئێوەدا، یان شەهیدیی–، چیترمان بۆچاوەڕوان دەکەن ؟ ﴿ونحن نتربص بكم﴾ وا ئێمەش چاوەڕوانین ﴿أن يصيبكم الله بعذاب من عنده أو بأيدينا﴾ کە خوا بەسزایەکی ئاسمانیی خۆی ، یان بەدەستی ئێمە دووچارتان بکات ﴿فتربصوا إنا معكم متربصون﴾ دەسا چاوەڕوان بن، وا ئێمەش پێکەوە چاوەڕوان دەبین، بزانن کێمان دووچار دەبێ؟ ﴿٥٣ قل انفقوا طوعا أو كرها لن يتقبل منكم﴾ پێیان بلێ: بەخۆشیی، یان بەزۆرو ناخۆشیی ببەخشن ، خواهەر لێتان وەرناگرێ ﴿إنكم كنتم قوما فاسقين﴾ چونکە بێ سۆ ئێوە گەلێکی سنوور بەزێن بوون. (ئیبن عەباس) ئەڵێ: ئەم ئایەتە لە بارەی (جەددی کوڕ قەیس)ـەوە هاتە خوارێ، چونکە درۆیەکی هەڵبەست و داوای کرد وازی لێبهێنن ونەیبەنە خەزاوە ﴿٥٤ وما منعهم أن تقبل منهم نفقاتهم﴾ لەبەر ئەمەیە هیچ ماڵ بەخشینێکیشیان بۆرێی خوا لێوەرناگیردرێ ﴿إلا أنهم كفروا بالله وبرسوله﴾ چونکە باوەڕیان بە خواو بە پەیامبەرەکەی ئەو نەکرد ﴿ولا يأتون الصلاة إلا وهم كسالى﴾ و هەرنوێژێکیش بکەن زۆر بەقورس و لەش بەبارو و تەمەڵیەوە دەیکەن ، چونکە بەدڵ نایکەن و، مەبەستیان تەنها ڕووپامایی و ریاییە. (ئیبن عەباس) ئەڵێ: ئەمە سروشتیی خەڵکی دوو ڕووە: کە ئەگەر کاتی نوێژ بێ و، نەتوانی خۆی لێ دەرباز بکات ، ئەوا نوێژ ئەکا، خۆ ئەر بەتەنها بوو ناچێ بەلایدا ! ﴿ولا ينفقون إلا وهم كارهون﴾ وهەرشتێکیش ببەخشن –لەرێی خوادا– بە ناحەزو پێ ناخۆشبوون دەیبەخشن ﴿٥٥ فلا تعجبك أموالهم ولا أولادهم﴾ نابێ زۆریی دارایی و زارۆو منالیان سەرسامت بکاو، لەسوورەتێکی تردا دەفەرموێ: (ولا تمدن عينيك إلى ما متعنا به أزواجا منهم زهرة الحياة الدنيا) بۆ پشتگیریی و دووپاتکردنەوەی هەمان مەبەست. ﴿إنما يريد الله ليعذبهم بها في الحياة الدنيا﴾ چونکە خوا ئەیەوێ بەماڵ و سامان و ئەولادیان هەر لەم ژیانی دونیایە سزایان بدات، چونکە بەنیفاق زەکاتی لێ دەدەن و، پاشانیش دبێتە داخ وحەسرەت بۆیان ﴿وتزهق أنفسهم وهم كافرون﴾ و بەسەختیش بمرن و، کافرو بێ باوەڕبن ﴿٥٦ ويحلفون بالله إنهم لمنكم﴾ سوێند بە خوا ئەخۆن ودەڵێن: بە ڕاستی ئێمە لە ئێوەین ﴿وما هم منكم﴾ لەراستیشدا درۆ دەکەن و لە ئێوە نین ﴿ولكنهم قوم يفرقون﴾ بەڵکو گەلێکی ترسنۆکن، بۆیە ئەوسوێندەش دەخۆن ئێوە وازیان لێبهێنن و نەیانکوژن ﴿٥٧ لو يجدون ملجأ أومغارات أومدخلا﴾ ئەوەندە ترسنۆکن گەر پەناگەیەکیان دەسکەوێت، یان ئەشکەوتێك، یان ژێر زەمینێك ، ئەگەر چی کونێکی زۆر بچکۆلەو تەسکیش بێ ﴿لولوا إليه وهم يجمحون﴾ زۆر بە پەلەو بەچەسپانیی–وەکو ئەسپی

سەرکێش- خۆیانی بۆ لوولەدەن وخۆ بزردەکەن!! واتە: ئەوەندە ڕقیان لێتانە هەرگیز حەزناکەن ڕووتان تێبکەن وبتانبینن!

**گلەو گازندەی دوو ڕووەکان لە صەدەقە بەخشیندا:**

پێشەوا (موسلیم)ئەڵێ: کاتێ پەیامبەر ﷺ دەستکەوتەکەی جەنگی (حونەین)ی دابەشکرد، پیاوێك لە دوو ڕووەکان هات و گوتی: موحەممەد !.دادگەر بە !! بە ڕاستیی تۆ پیاوێکی دادگەرنیت! پەیامبەریش ﷺ فەرمووی ((ویلك إن لم أعدل فمن یعدل؟)) واتە: تیاچیت ! باشە ! ئەر من دادگەر نەبم، دەبێ کێ دادگەر بێ ؟ پاشانیش ئەم ئایەتە هات وفەرمووی: ﴿٥٨ ومنهم من یلمزك فی الصدقات﴾ لە دوو ڕووەکاندا هەیە عەیبدارت دەکا لەدابەشکردنی صەدەقەداو بەدڵی ئەو نیە! ﴿فإن أعطوا منها رضوا﴾ خۆ ئەگەر بەشی خۆیانیان لێبدرایە دڵشادو ڕازی دەبوون ﴿وإن لم یعطوا منها إذا هم یسخطون﴾ و ئەگەر بەشیان نەدرابا لێی، دەبینی بەخێرایی تووڕەو قەڵسدەبن و ڕقت لێ هەڵدەگرن، وەك ئەو کابرایە لەخۆیەوە ئەوقسانەی تووڕدا! ﴿٥٩ ولوا أنهم رضوا ما آتاهم الله ورسوله﴾ خۆ ئەگەر لەباتی ئەو ڕەخنەو عەیبدار کردنەیان، ڕازیی بووبان بەو بەشەی خواو پەیامبەرەکەی پێیدان ﴿وقالوا حسبنا الله﴾ وگوتبایان خوامان بەسە ﴿سیؤتینا الله من فضله ورسوله﴾ و دڵنیاشین لە ئایندەدا خوای میهرەبان لە فەزڵ وچاکەی خۆی پێمان دەبەخشێ و، پێغەمبەریش پتر لەوەمان دەداتێ ﴿إنا إلی الله راغبون﴾ وە ئێمە حەزمان هەر لەگوێڕایەڵی و بەر فەرمانی خوایە، ئەگەر ئەمەیان گوتبا، قازانج و خێربوو بۆیان .

**زەکات تەنها بەمانە دەشێ :**

پاش ئەوە مونافیقەکان پێغەمبەریان عەیبدار کرد لەشێوەی دابەشکردنی صەدەقەکەدا، خوای کار دروست فەرمووی: ﴿٦٠ إنما الصدقات للفقراء والمساکین﴾ صەدەقەو زەکات هەر بۆ هەژاران و بێ نەوایان و ﴿والعاملین علیها﴾ کرێکارانی کۆکەرەوەی زەکات ، واتە: ئەودەزگایە هەڵدەسێ بەکۆکردنەوەیی ودابەشکردنی بەسەر (صنف)ـەکاندا ﴿والمؤلفة قلوبهم﴾ وە بەوانەی ئومێد هەیە لەئاییندەدا دڵیان بە ئیسلامەوە هۆگرببێ ، (ئەمیر)ی موسڵمانان دەتوانێ دیاریی و زەکات و، هەرشتێکی ترخۆی بەباشی بزانێ بنێرێ بۆ ئەوجۆرە کەسانە، تابەشکو هۆگرببن . پێشەوا (ئەحمەد و موسلیم وترمزیی) دەگێڕنەوە کە: (صەفوانی کوڕی ئومەیە) گوتی: زۆر ڕقم لە پەیامبەر بوو ! بەڵام هەر ئەوەندە دیاریی و بەخششی بۆ ناردم، هەتا بوویە خۆشەویستترینی کەسم ﴿وفی الرقاب﴾ وە بۆ ئازاد کردنی بەندەو یەخسیرەکان، هەتا خۆیانی پێ ڕزگاربکەن و لەکۆیلایەتی ئازاد ببن ﴿والغارمین﴾ وە بۆ دانەوەی قەرزی قەرزارەکان، واتە: ئەوانەی لەخزمەتی ڕێگەی ئیسلامدا قەرزار بوون ﴿وفی سبیل الله﴾ و لە پێناوی ڕێی خوادا ، واتە: بۆ ئەو موجاهیدانەیە هەمیشە

الجزء العاشر — سورة التوبة

فَلَا تُعْجِبْكَ أَمْوَٰلُهُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُهُمْ ۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُم
بِهَا فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَتَزْهَقَ أَنفُسُهُمْ وَهُمْ كَٰفِرُونَ ﴿٥٥﴾
وَيَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ إِنَّهُمْ لَمِنكُمْ وَمَا هُم مِّنكُمْ وَلَٰكِنَّهُمْ
قَوْمٌ يَفْرَقُونَ ﴿٥٦﴾ لَوْ يَجِدُونَ مَلْجَـًٔا أَوْ مَغَٰرَٰتٍ
أَوْ مُدَّخَلًا لَّوَلَّوْا۟ إِلَيْهِ وَهُمْ يَجْمَحُونَ ﴿٥٧﴾ وَمِنْهُم مَّن يَلْمِزُكَ
فِى ٱلصَّدَقَٰتِ فَإِنْ أُعْطُوا۟ مِنْهَا رَضُوا۟ وَإِن لَّمْ يُعْطَوْا۟ مِنْهَآ إِذَا
هُمْ يَسْخَطُونَ ﴿٥٨﴾ وَلَوْ أَنَّهُمْ رَضُوا۟ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ
وَرَسُولُهُۥ وَقَالُوا۟ حَسْبُنَا ٱللَّهُ سَيُؤْتِينَا ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ
وَرَسُولُهُۥٓ إِنَّآ إِلَى ٱللَّهِ رَٰغِبُونَ ﴿٥٩﴾ ۞ إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ
لِلْفُقَرَآءِ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱلْعَٰمِلِينَ عَلَيْهَا وَٱلْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ
وَفِى ٱلرِّقَابِ وَٱلْغَٰرِمِينَ وَفِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ ۖ
فَرِيضَةً مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٦٠﴾ وَمِنْهُمُ
ٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱلنَّبِىَّ وَيَقُولُونَ هُوَ أُذُنٌ ۚ قُلْ أُذُنُ خَيْرٍ
لَّكُمْ يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَيُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِينَ وَرَحْمَةٌ لِّلَّذِينَ
ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ ۚ وَٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ رَسُولَ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦١﴾

ئامادەن بۆپاراستنی سنوورەکانی ئیسلام و دەچنە جیهاد ﴿وابن السبیل﴾ وە بۆ ئەو ڕێبوارانەش کە لەڕێگادا توێشوویان لێدەبڕێ و ناگەنەوەجێگای خۆیان ، واتە: زەکات هەر بۆ ئەم هەشت صنفەیە ، ئیتر کەسێکی تر بۆی نیە دەست بخاتە کارو باریەوەو، ڕەخنە بگرێ و داوای بەش بکات ﴿فریضة من الله﴾ بڕیاری خوایەو، ئەو خۆی بڕیویەتیەوە، کەس دەستی تێوەر نەدا ﴿والله علیم حکیم﴾ و خوا چاك زانایە، دەزانێ کێ پێیشیاوە، کار بەجێ و لە کارزانە، هەموو بڕیارێکی لەجێی خۆیدایە.

**زانیاری یەك :** ئاخۆ پێویست بێ ئەم زەکاتە بدرێ بەهەر هەشت صنفەکە..؟ یان ئەگەر بە تەنها کەسێکیش بدرێ هەرئەبێ ؟ ئیمامی شافعیی و کۆمەڵێك لە زانایان ڕای یەکەمیان پەسەندکردووە، ئیمامی (مالیك)ودەستەیەك (لەم بەڕێزانە وەکو: (عومەر، حوزەیفە، ئیبن عەباس، سەعیدی کوڕی جوبەیر) ڕاو بۆچوونی دووەمیانی هەڵبژاردووە ، تەنانەتی ئەگەر هەربەیەك کەسیش بدرێ دروستە.

## سیماو ڕەوشی دووڕووەکان:

﴿[٦١] ومنهم الذین یؤذون النبی﴾ لەناو دوو ڕووەکاندا خەڵکی وا هەیە کە بەقسەی نابەجێ پەیامبەر ﷺ ئازار دەدا (وەکو نەبتەلی کوڕی حاریس)ی شەیتان ﴿ویقولون هو اذن﴾ وە بەپێغەمبەر دەڵێن: خۆش باوەڕو گوێ لە مشتە، واتە: گوێ بۆ هەموو قسەیەك دەگرێ ﴿قل اذن خیر لکم﴾ بلێ: تەنها گوێ لەچاکەیەك ئەگرێ ، قازانجی ئێوە بێت ، گوێ هەر بۆ قسەی ڕاست و خێر دەگرێ ﴿یؤمن بالله﴾ باوەڕی کاملی بەخوا هەیە ، هەرچی بفەرموێ پیادەی دەکات ﴿ویؤمن للمؤمنین﴾ بە موسڵمانەکانیش باوەڕ دەکات ﴿ورحمة للذین آمنوا منکم﴾ و بەزەیی و میهرەبانیشە بۆ ئەوانەتان بڕوایان هێناوە، چونکە ڕێنمایی خێریان ئەکات ﴿والذین یؤذون رسول الله﴾ ئەوانەش کە پەیامبەری خوا ﷺ ئازار دەدەن (وەکو جوللاسی کوڕی سووەید) ﴿لهم عذاب الیم﴾ سزایەکی ئێش پێگەیەنەریان بۆ هەیە. لە سوورەتی (ئەحزاب)یشدا ئەم ئایەتە هاتووەو دەفەرموێ: (إن الذین یؤذون الله ورسوله لعنهم الله في الدنیا والآخرة وأعد لهم عذابا مهینا) ﴿[٦٢] یحلفون بالله لکم لیرضوکم﴾ سوێندتان بەخوا بۆ دەخۆن کە هیچ شتێکی خراپیان نەوتووە- بۆ ئەوە ئێوە ڕازی بکەن ﴿والله ورسوله احق ان یرضوه﴾ خۆ خواو پەیامبەری ئەو ﷺ شایستە ترن ، لەخۆیانیان ڕازی بکەن ﴿إن کانوا مؤمنین﴾ ئەگەر بەڕاستیی موسڵمان بن و، بڕوایان بە فەرموودەی خوا هەبێ ﴿[٦٣] الم یعلموا انه من یحادد الله ورسوله﴾ ئەی بۆ نەیانزانیوە کە ئەوی لەگەڵ خواو لەگەڵ پەیامبەرەکەیدا ﷺ ململانێ بکاو دژیان بووەستێ و، سەنگەریان لێبگرێت ﴿فان له نار جهنم خالدا فیها﴾ بێگومانبێ ئاگری دۆزەخ بەشیەتی و، بە هەتا هەتاییش لەوێ ئەبێ ﴿ذلك الخزی العظیم﴾ ئەوەیە بەد نێویی و ریسوایی گەورەو مەزن ﴿[٦٤] یحذر المنافقون ان

الجزء العاشر — سورة التوبة

يَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ لَكُمۡ لِيُرۡضُوكُمۡ وَٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَحَقُّ
أَن يُرۡضُوهُ إِن كَانُواْ مُؤۡمِنِينَ ﴿٦٢﴾ أَلَمۡ يَعۡلَمُوٓاْ أَنَّهُۥ
مَن يُحَادِدِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَأَنَّ لَهُۥ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدٗا فِيهَاۚ
ذَٰلِكَ ٱلۡخِزۡيُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿٦٣﴾ يَحۡذَرُ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ
أَن تُنَزَّلَ عَلَيۡهِمۡ سُورَةٞ تُنَبِّئُهُم بِمَا فِي قُلُوبِهِمۡۚ قُلِ ٱسۡتَهۡزِءُوٓاْ
إِنَّ ٱللَّهَ مُخۡرِجٞ مَّا تَحۡذَرُونَ ﴿٦٤﴾ وَلَئِن سَأَلۡتَهُمۡ
لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلۡعَبُۚ قُلۡ أَبِٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ
وَرَسُولِهِۦ كُنتُمۡ تَسۡتَهۡزِءُونَ ﴿٦٥﴾ لَا تَعۡتَذِرُواْ قَدۡ كَفَرۡتُم
بَعۡدَ إِيمَٰنِكُمۡۚ إِن نَّعۡفُ عَن طَآئِفَةٖ مِّنكُمۡ نُعَذِّبۡ طَآئِفَةَۢ
بِأَنَّهُمۡ كَانُواْ مُجۡرِمِينَ ﴿٦٦﴾ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ وَٱلۡمُنَٰفِقَٰتُ
بَعۡضُهُم مِّنۢ بَعۡضٖۚ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡمُنكَرِ وَيَنۡهَوۡنَ
عَنِ ٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَقۡبِضُونَ أَيۡدِيَهُمۡۚ نَسُواْ ٱللَّهَ فَنَسِيَهُمۡۚ
إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴿٦٧﴾ وَعَدَ ٱللَّهُ
ٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱلۡمُنَٰفِقَٰتِ وَٱلۡكُفَّارَ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ
فِيهَاۚ هِيَ حَسۡبُهُمۡۚ وَلَعَنَهُمُ ٱللَّهُۖ وَلَهُمۡ عَذَابٞ مُّقِيمٞ ﴿٦٨﴾

١٩٧

﴿تنزل علیهم سورة﴾ دوو ڕووەکان هەمیشە دەترسن کە لە بارەیانەوە سوورەتێك بێتە خوارێ ﴿تنبئهم بما فی قلوبهم﴾ نهێنیەکانی دڵیانیان بە بڕوادارەکان بڵێت ﴿قل استهزئوا﴾ بڵێ: بەئارەزووی خۆتان گاڵتە بکەن" بەدین و ئیمان" بەنهێنیێ و بەئاشکرا ! ﴿إن الله مخرج ما تحذرون﴾ بێگومانبن لەهەرچی دەترسن خوا دەریخات، زۆر بەباشی ئاشکرای دەکا بۆ موسڵمانەکان. لەچەند جێگایەکی تردا ئەو ڕاستیە دەخاتە ڕووو، بۆنموونە لە سوورەتی: (٢٩/٤٧)دا هاتووەو دەفەرموێ: (أم حسب الذین فی قلوبهم مرض أن لن یخرج الله أضغانهم) یان لە سوورەتی (٣٠/٤٧)دا دەفەرموێ: (ولتعرفنهم فی لحن القول..) یان لەسوورەتی (٤/٦٣)دا دەفەرموێ: (..یحسبون کل صیحة علیهم..) ﴿٦٥ ولئن سألتهم﴾ ئەگەر لێیان بپرسیت: سەبارەت بە گاڵتە کردن بەخواو ئایەتەکانی و پێغەمبەری خوا: ﴿لیقولن إنما کنا نخوض ونلعب﴾ ئەڵێن: بەڕاستمان نەبووەو، بەڵکو تەنها گاڵتەو گەپمان دەکرد. (قەتادە) دەڵێت: لەو دەمەدا کەپێغەمبەر ﷺ سەرقاڵی غەزای (تەبووك) بوو، چەند سوارێك لە دووڕووەکان بەبەردەمیا تێپەڕین و گوتیان: زۆر سەیرە! ئەم پیاوە پێی وایە کە کۆشك وقەڵای ڕۆمەکان دەگرێ ؟! های های لەوە! پاشان ئەم قسەیە بەپێغەمبەر ﷺ گەیشتەوە، ئەویش بانگی کردن وگوتیان: ئەمە سوێندی بێ بەگاڵتەوە گوتومانە، ئەوسا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوەو فەرمووی: ﴿قل أبالله وآیاته ورسوله کنتم تستهزؤن﴾ پێیان بڵێ: ئایا گاڵتەتان بەخواو ئایەتەکانی و، بەپێغەمبەرەکەی کردبوو؟ واتە: هەر وتەیکی کوفرو ناشیرین و ناقۆڵا لەدەم دەرچێت، بێگومانە مرۆڤی پێ کافر دەبێت ﴿٦٦ لا تعتذروا قد کفرتم بعد إیمانکم﴾ بڵێ: بڕوبیانووی بێجێ مەهێننەوە، چونکە پاش ئەوە باوەڕتان هێنا، کافربوونەوە ﴿إن نعف عن طائفة منکم﴾ ئەر لەبڕێکتان خۆش ببین لەبەر ئەوە کەپەشیمان بوونەوە لەگوتەکەتان ﴿نعذب طائفة بأنهم کانوا مجرمین﴾ ئەوا جەزرەبەی بڕێکیان دەدەین بەهۆی ئەوەی تاوانکاربوون، واتە: بەردەوام بوون لەسەر کوفرو نیفاق.

## ژن و پیاوی دوو ڕوو وەکو یەکن:

﴿٦٧ المنافقون والمنافقات بعضهم من بعض﴾ پیاوو ژنی دووڕوو هەموو وەکو یەکن، واتە: جیاوازی لەنێو نێروو مێیاندا نیە، چونکە سروشتی گشتیان یەکە ﴿یأمرون بالمنکر وینهون عن المعروف﴾ فەرمان بەخراپە دەدەن و ڕێ بەچاکە دەگرن ﴿ویقبضون ایدیهم﴾ و دەست لەماڵ بەختکردن بۆ ڕێی خوا دەقوچێنن ﴿نسوا الله﴾ فەرمانی خوایان لەبیر خۆ بردەوە ﴿فنسیهم﴾ خوایش ئەوانی – بۆ گشت کارێکی چاك– لە بیرکرد ﴿إن المنافقین هم الفاسقون﴾ بە ڕاستیی هەردوو ڕووەکانن لە سنوور دەرچوو ﴿٦٨ وعد الله المنافقین والمنافقات والکفار نار جهنم خالدین فیها﴾ خوا بڕیاری ئاگری دۆزەخی بە پیاوو و ژنانی دووڕوو و خەڵکانی خوانەناس داوە، بە هەتا هەتایی لەوێ دەبن ﴿هی حسبهم﴾ ئاگری دۆزەخیشیان بەسەو، ڕەسایان دەکات بۆ جەزرەبەو سزایان ﴿ولعنهم الله﴾ و خوا لە بەزەیی خۆیشی دووری خستنەوە ﴿ولهم عذاب مقیم﴾ بێ لەوەش سزای هەمیشەیی بەشیانە ﴿٦٩ کالذین من قبلکم﴾ حاڵی ئێوە ئەی مونافقەکان وەك حاڵی ئەوانەی پێش خۆتانە ﴿کانوا أشد منکم قوة واکثر أموالا وأولادا﴾ کە لەئێوە بەهێز تربوون و، ماڵ و منداڵیشیان لە ئێوە پتر بوو، کەچی ئەوانە گشت نەیانتوانی سزایان لێ وەدوورخەن ﴿فاستمتعوا بخلاقهم﴾ بەدینی خۆیان بەهرەمەند بوون و، ماوەیەکیان پێ بردەسەر ﴿فاستمتعتم بخلاقکم﴾ ئێوەیش هەروا بەدینی خۆتان بەهرەمەند بوون و، ماوەیەك بۆ خۆتان بەخۆشی ژیان ﴿کما استمتع الذین من قبلکم بخلاقهم﴾ هەر چۆنێ ئەوانەی بەر لەئێوە بەدینی خۆیان بەهرەمەند بوون و، ماوەیەك بۆخۆیان ژیان . (ئیبن کەسیر) دەڵێ: مەبەست بەوخەڵکانەی پێش خۆیان، جوولەکەیە، پێغەمبەریش لەوبارەیەوە دەفەرموێ:

((والذی نفسی بیده لتتبعن سنن الذین من قبلکم شبرا بشبر، وذراعا بذراع، وباعا بباع حتی لو دخلوا جحر ضب لدخلتموه، قالوا ومن هم یا رسول الله ؟ أهل الکتاب؟ قال: فمن) واتە: سوێندم بەوکەسە گیانی منی بەدەستە بست بە بست، گەز بەگەز پەیڕەویی لەو موسایی و عیساییانە دەکەن بەر لەخۆتان بوون، تەنانەتی ئەگەر بچنە کونی سووسە مارەوە (چەند تەنگ و بچووکە) ئێوەیش هەوڵ دەدەن خۆتانی پیابکەن! ﴿وخضتم کالذی خاضوا﴾ وەکو ئەوان سەریان لەناهەقیینا، ئێوەش بەخەستی ڕۆچوون تێیداو، هەردوولا سەرتان لە بێ دینییەوە دەرچوو ﴿أولئك حبطت أعمالهم فی الدنیا والآخرة﴾ کارو کردەوەی چاکی ئەمانە لەدنیاو لەقیامەت بێهوودەو، بێپاداش مایەوە ﴿وأولئك هم الخاسرون﴾ وهەر ئەوانەشن دۆڕاوو زیانبار ﴿٧٠ الم یأتهم نبأ الذین من قبلهم﴾ ئاخۆ – ئەو دوو ڕووانە – دەنگ و باسی ئەوانەی بەر لە خۆیانیان پێنەگەیشتووە ؟ کەچۆن سەرپێچییان کردو، لەناومان بردن ﴿قو نوح وعاد وثمود وقوم إبراهیم وأصحاب مدین والمؤتفکات﴾ ئەو گەلانەیش یاخی بوون و لەناومان بردن ئەمانەبوون: هۆزو گەلی (نووح)، عادی (هوود)، سەموودی (صالح)، خەڵکی(مەدیەن)ی هۆزەکەی(شوعەیب) وشارو گوندەکانی گەلی(لووط) ﴿أتتهم رسلهم بالبینات﴾ پەیامبەرەکانیان گەلێ نیشانەو بەڵگەی زۆر ڕۆشنیان بۆهێنان، کەچی هەر بڕوایان پێ نەکردن و، ئەوساش خوا لەبنی هێنان ﴿فما کان الله لیظلمهم﴾ خوا بەناهەق وستەم لەناوی نەبردن ﴿ولکن کانوا انفسهم یظلمون﴾ بەڵکو بۆ خۆیان ستەمیان لەخۆیانکرد، ئەو هەموو لاریی و لاسارییەیانکرد، ئێمەیش بۆ دوایی فەوتانمانن، باشە! دوو ڕووەکان دڵنیان ئەو سزایەیان ئەوقە نابێ؟ ﴿٧١ والمؤمنون والمؤمنات بعضهم أولیاء بعض﴾ پیاوان و ژنانی باوەڕدار هەموو دۆست و خۆشەویست و یارمەتیدەری یەکن" لە گشت خۆشیی و ناخۆشیەکدا ﴿یأمرون بالمعروف وینهون عن المنکر﴾ و هەردەم فەرمان بە چاکە دەدەن و، لە خراپە ڕیگری دەکەن ﴿ویقیمون الصلاة﴾ و هەڵئەسن بە نوێژ و ﴿ویؤتون الزکاة﴾ و زەکات ئەدەن ﴿ویطیعون الله ورسوله﴾ وئیتاعەو ملکەچن بۆ فەرمانەکانی خواو پەیامبەرەکەی ئەو ﴿أولئك سیرحمهم الله﴾ بێگومان خوا ئەوانە هەر دەخاتە بەر میهرەبانی وبەزەیی خۆی ﴿إن الله عزیز حکیم﴾ چونکە بێگومان خوا زۆر دەسەڵاتدارە، لە کارزان و کار بەجێیە.

الجزء العاشر — سورة التوبة

كَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ كَانُوٓاْ أَشَدَّ مِنكُمۡ قُوَّةٗ وَأَكۡثَرَ
أَمۡوَٰلٗا وَأَوۡلَٰدٗا فَٱسۡتَمۡتَعُواْ بِخَلَٰقِهِمۡ فَٱسۡتَمۡتَعۡتُم بِخَلَٰقِكُمۡ
كَمَا ٱسۡتَمۡتَعَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُم بِخَلَٰقِهِمۡ وَخُضۡتُمۡ
كَٱلَّذِي خَاضُوٓاْۚ أُوْلَٰٓئِكَ حَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا
وَٱلۡأٓخِرَةِۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ٦٩ أَلَمۡ يَأۡتِهِمۡ
نَبَأُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ قَوۡمِ نُوحٖ وَعَادٖ وَثَمُودَ وَقَوۡمِ
إِبۡرَٰهِيمَ وَأَصۡحَٰبِ مَدۡيَنَ وَٱلۡمُؤۡتَفِكَٰتِۚ أَتَتۡهُمۡ
رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِۖ فَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظۡلِمَهُمۡ وَلَٰكِن
كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ٧٠ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بَعۡضُهُمۡ
أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ
وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ
وَرَسُولَهُۥٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ سَيَرۡحَمُهُمُ ٱللَّهُۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ٧١
وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا
ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَمَسَٰكِنَ طَيِّبَةٗ فِي جَنَّٰتِ عَدۡنٖۚ
وَرِضۡوَٰنٞ مِّنَ ٱللَّهِ أَكۡبَرُۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ٧٢

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ — ١٩٨

بۆزانین: (ئالووسیی) دەڵێت: هەر کردارێکی خوا : پیتی(س)ی لەسەربوو، بۆ تەئکییدو جەخت لە سەر کردنەوەیە ، بۆیە ئێمەیش تەفسیری (سیرحمهم الله)مان بە پێی ئەوەکرد.

**لەگەڵ خوانەناسان توندو تیژ بە :**

﴿[٧٢] وعد الله المؤمنين والمؤمنات جنات تجري من تحتها الأنهار﴾ خوا بەڵێنی بە پیاوو ژنە باوەڕدارەکان داوە بەباخ گەلێك لەبەهەشتدا: لەژێر کۆشك و تەلارو دارو درەختەکانیاندا ڕووبار گەلێك دێت و دەچێت ﴿خالدين فيها﴾ بە هەتا هەتاییش لەوێ دەمێننەوە ﴿ومساكن طيبة في جنات عدن﴾ و بێ لەوەش چەندین خانوو بەرەی پاك و خاوێنی لەناو بەهەشتە هەتاهەتاییەکاندا بۆئامادەکردوون ﴿ورضوان من الله أكبر﴾ سەرەڕای ئەوانە، ڕەزامەندیی خوا لەهەموو گەورەترو خۆشترە ﴿ذلك هو الفوز العظيم﴾ هەرئەوە بە ختیاریی و سەرفرازیی گەورەو مەزنە ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ئەوکەسەی باوەڕی بەخواو بە پێغەمبەری ئەوەو، بەباشی نوێژ دەکاو، ڕۆژووی ڕەمەزان دەگرێ، دەشێ خوا بیخاتە بەهەشتەوە، هیجرەتی کردبێ، یان لە زێدی خۆیدا مابێتەوە، گوتیان: ئایا ئەم مژدە خۆشە بەخەڵکی تر نەدەین ؟ فەرمووی: لە بەهەشتدا سەد پلە هەیە ، نێوان ئەم پلە بۆ ئەو پلە ئەندازەی دووری نێوان ئاسمان و زەوییە ، خوای بەخشندە ئامادەی کردووە بۆ موجاهیدان، دەسا هەر کە داوای بەهەشتتان کرد داوای (فیردەوس) بکەن، چونکە ئەو فیردەوسە لای سەرووو ناوەڕاستیی بەهەشتە، ڕووبارەکانی بەهەشتیش لەوێ هەڵدەقوڵێن، عەرشی خوا لەسەرڕوویانەوەیە. (متفق عليه). ﴿[٧٣] يا أيها النبي جاهد الكفار والمنافقين﴾ ئەی پەیامبەرﷺ! لەگەڵ بێ بڕوایان و دو ڕوووەکاندا بە(شیر) جەنگ و جیهاد بکە ﴿واغلظ عليهم﴾ و توندوتیژ بە لەگەڵیان و، نەرمییان لەگەڵ نیشان مەدە ﴿ومأواهم جهنم﴾ و لەپاشەڕۆژیشدا جێ وڕێیان هەر دۆزەخە ﴿وبئس المصير﴾ و دۆزەخیش جێ وشوێنێکی ئێجگار دژوارو خراپە، لەسوورەتی (تەحریم)یشدا بۆ جەخت لەسەر توندوتیژی بەرامبەر بە موشریك و کافران دەفەرموێ: (يا أيها النبي جاهد الكفار والمنافقين واغلظ عليهم ومأواهم جهنم وبئس المصير). قورتوبیی ئەڵێ: (وهذه الآية نسخت كل شئ من العفو والصلح). واتە: ئەم ئایەتە هەموو صوڵح و سازش و لێبوردنێکی هەڵوەشاندۆتەوە. (جولاسی کوڕی سووەید) گوتی: ئەر ئەوە ڕاست بێت موحەممەد دەیڵێت، ئەوا ئێمە لە گوێدرێژ نەزانتر و خراپترین ! جابۆدوایی ئەم قسەیە بەپێغەمبەر گەیشتەوەو، جوڵاسیش زانیی و هات و کەوتە پاکانە بۆخۆی، ئەوجا ئەم ئایەتە هات و فەرمووی: ﴿[٧٤] يحلفون بالله ما قالوا﴾ سوێند بە خوا ئەخۆن کە: وشەی کوفرو بێ باوەڕیی بە زاریاندا نەهاتووە، قسەی خراپیان بە پەیامبەرﷺ نەگوتوە ﴿ولقد قالوا كلمة الكفر﴾ خۆ لە واقیعیشدا قسەی کوفر و خوانەناسییان گوتبوو ﴿وكفروا بعد إسلامهم﴾ و دوای ڕاگەیاندنی ئیسلامبوونیشیان، دیسان گەڕابوونەوە سەر کوفرو، خۆیان کافر کردبوویەوە ﴿وهموا بما لم ينالوا﴾ وبەو مەبەست و نیازە پیسەشیان نەگەیشتن، لێبڕابوون کە پەیامبەر لە (ليلةالعقبة)دا لە (تەبووك) بکوژن! بەڵام

الجزء العاشر    سورة التوبة

يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ جَـٰهِدِ ٱلْكُفَّارَ وَٱلْمُنَـٰفِقِينَ وَٱغْلُظْ عَلَيْهِمْ
وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٧٣﴾ يَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ
مَا قَالُوا۟ وَلَقَدْ قَالُوا۟ كَلِمَةَ ٱلْكُفْرِ وَكَفَرُوا۟ بَعْدَ إِسْلَـٰمِهِمْ
وَهَمُّوا۟ بِمَا لَمْ يَنَالُوا۟ وَمَا نَقَمُوٓا۟ إِلَّآ أَنْ أَغْنَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ
مِن فَضْلِهِۦ فَإِن يَتُوبُوا۟ يَكُ خَيْرًا لَّهُمْ وَإِن يَتَوَلَّوْا۟ يُعَذِّبْهُمُ
ٱللَّهُ عَذَابًا أَلِيمًا فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ وَمَا لَهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ
مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿٧٤﴾ ۞ وَمِنْهُم مَّنْ عَـٰهَدَ ٱللَّهَ لَئِنْ
ءَاتَىٰنَا مِن فَضْلِهِۦ لَنَصَّدَّقَنَّ وَلَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿٧٥﴾
فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُم مِّن فَضْلِهِۦ بَخِلُوا۟ بِهِۦ وَتَوَلَّوا۟ وَّهُم مُّعْرِضُونَ
﴿٧٦﴾ فَأَعْقَبَهُمْ نِفَاقًا فِى قُلُوبِهِمْ إِلَىٰ يَوْمِ يَلْقَوْنَهُۥ بِمَآ أَخْلَفُوا۟
ٱللَّهَ مَا وَعَدُوهُ وَبِمَا كَانُوا۟ يَكْذِبُونَ ﴿٧٧﴾ أَلَمْ يَعْلَمُوٓا۟
أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَىٰهُمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ عَلَّـٰمُ
ٱلْغُيُوبِ ﴿٧٨﴾ ٱلَّذِينَ يَلْمِزُونَ ٱلْمُطَّوِّعِينَ مِنَ
ٱلْمُؤْمِنِينَ فِى ٱلصَّدَقَـٰتِ وَٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا
جُهْدَهُمْ فَيَسْخَرُونَ مِنْهُمْ سَخِرَ ٱللَّهُ مِنْهُمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٩﴾

١٩٩

خەیاڵیان خاو بوو و بۆیان نەچوویە سەر، بۆ دوایش ئەوهەواڵ و دەنگ وباسەیان بە پێغەمبەر ﷺ گەیاندو، ئەویش لەتۆڵەی ئەوجم و جووڵە ناپەسەندەیان ویستی بیانکوژێ، بەڵام لەبەر دیعایەی خراپ و چاوو ڕای خەڵکانی نەیار نەیکوشتن ! ﴿وما نقموا إلا أن أغناهم الله ورسوله من فضله﴾ هەر لەبەر ئەوەش رکیان لەموسڵمانەکان بوو ، کە: خوای دلۆڤان بەمیهرەبانیی خۆی بێ نیازی کردبوون لەوان و، نازو نیعمەتێکی زۆری پێدابوون و، پەیامبەریش لەدەستکەوتە جەنگییەکان دریغی لێنەدەکردن، لەبەرئەوە کەبڕێك لەژێر سێبەری ئیسلامدا ژیابوونەوە پێیان ناخۆش بوو! لە چەند جێگایەکی تردا قورئانی پیرۆز ئەم راستیە دوپات دەکاتەوە، بۆنموونە: لەسوورەتی (٨/٨٥)دا دەفەرموێ:(وما نقموا منهم إلا أن يؤمنوا بالله العزيز الحميد) یان لە سوورەتی (٧/١٢٦)دا دەفەرموێ: (وما تنقم منا إلا أن آمنا بأيات ربنا لما جاء تنا..) یان لەسوورەتی (٢٢/٤٠)دا دەفەرموێ: (الذين أخرجوا من ديارهم بغير حق إلا أن يقولوا ربنا الله..) .﴿فإن يتوبوا يك خيرا لهم﴾ ئینجا ئەگەر بەو حاڵەشەوە پەشیمان ببنەوە– لەکاری ناپاکیی ودوو ڕوویی خۆیان– خێرو قازانجیانە ﴿وإن يتولوا يعذبهم الله عذابا أليما فى الدنيا والآخرة﴾ خۆ ئەرپشتیش لە ئیسلام بکەن و، لەسەر کاری خراپی خۆیان سوور بن، خوای گەورەش – لەدنیاو لەقیامەتدا – سزایەکی ئێش پێگەیەنەریان دەدا ﴿وما لهم فى الأرض من ولى ولا نصير﴾ دیارە ئەوساش لەم سەر زەویەدا هیچ جۆرە دۆست و پشتیوانێکیان بۆ نابێ، ڕزگاریان بکات لەو سزایە. (ئیبن کەسیر) دەڵێ: زۆربەی راڤەکەرانی قورئان پێیان وایە ئەو پەیمان شکێنە (سەعلەبەی حاتەب)ی ئەنسارییە، چونکە وەکو(تەبەریی) دەڵێت: ئەوبوو لەپێغەمبەری خواست: دۆعای رزق و رۆزیی و سەروەت وسامانی بۆبکا، کەچی خوای بەخشندە خەلاتێکی زۆری کردو نەیشیتوانی پەیمانەکەی جێبەجێ بکا !. بەڵام (قورتبی) دەڵێت:(وثعلبة بدرى أنصارى وممن شهدالله له ورسوله بالإيمان، حسب مايأتى بيانه فى أول الممتحنة، فما روى عنه غير صحيح. قال أبو عمر: ولعل قول من قال فى ثعلبة أنه مانع الزكاة الذى نزلت فيه الآية غير صحيح ، والله أعلم . وقال الضحاك : إن الآية نزلت فى رجال من المنافقين : نبتل بن الحارث و جدبن قيس ومعتب بن قشير).لە پەراوێزی قورتبییدا هاتووە: (قال الإمام ابن عبد البر: ولعل قول من قال فى ثعلبة أنه مانع الزكاة الذى نزلت فيه الآية غير صحيح. وقال الحافظ ابن حجر فى الفتح (٣/٢٦٦) بعد أن أشار الى الحديث: لكنه حديث ضعيف لا يحتج به). (ئالووسیی) دەڵێ: (وليس هو البدرى لأنه قد أستشهد بأحد ﷺ). ﴿٧٥ ومنهم من عاهد الله﴾ هێندێك لە دوو ڕووەکان پەیمانیان لەگەڵ خوا بەست وگوتیان: ﴿لئن آتانا من فضله﴾ مەرج بێت ئەگەر خوا ماڵ وڕۆزییمان بداتێ ﴿لنصدقن ولنكونن من الصالحين﴾ خێرو صەدەقە بکەین و بچینە ڕیزی پیاوچاکانەوە ﴿٧٦ فلما آتاهم من فضله﴾ ئینجا کەخوا کردیی و لە رزق ونازونیعمەتی خۆی بەشیدان ﴿بخلوا به﴾ بەراست دەرنەچوون و، چرووکیی و ڕژدییان تیا کرد ﴿وتولوا وهم معرضون﴾ پشتیان لەفەرمانەکەی خواکردو، ڕوویان لە ئیسلام وەرگێڕا ﴿٧٧ فأعقبهم نفاقا فى قلوبهم إلى يوم يلقونه﴾ ئینجا خوای کارزان "بێ لە چرووکیەکەیشیان نەخۆشی دووڕوویی خستە دڵیانەوەو ، بەردەوامیش دەبێت هەتا ئەو رۆژە دەچنە بەردەستی خۆی بۆحیساب و لێکۆڵینەوە ﴿بما أخلفوا الله ماوعدوه﴾ چونکە پێچەوانەی ئەوپەیمانە جووڵانەوە بەخوایان دابوو ﴿وبما كانوا يكذبون﴾ وبەدرۆزنیش دەرچوون ﴿٧٨ ألم يعلموا أن الله يعلم سرهم ونجواهم﴾ مەگەر نەیانزانی کە بەڕاستیی خوا بەهەموو نهێنی و سرتە سرتەکانیان دەزانێ ؟! ﴿وأن الله علام الغيوب﴾ و لە هەرچی نادیاریشە بەئاگایەو، تۆڵەش لەناپاکان و دووڕووەکان دەسێنێت ، کەوابوو "ئێوەیش" ئەی موسڵمانان! هەربەڵێنێ دەدەن بیبەنە سەر، هەتا دووچارنەبن. (تەبەریی) لە (ئیبن عەبباس)ـەوە دەگێڕێتەوە کە:

(عبدالرحمن)ـی (کوڕی عەوف) چل هۆقە زێڕی هێنایە لای پەیامبەر ﷺ و کردیە صەدەقە، لەولایشەوە پیاوێکی هەژاری (ئەنصار)یی مەنێ خورمای هێنا، ئەوسا دوو ڕووەکان کردیانە هەراو هۆسەو گوتیان: ئەمە سوێندی بێ (عبدالرحمن) بە ڕووپامایی ئەوزێڕەی هێناوە، خۆ خواو پەیامبەریش لەو مەنە خورمایە بێ نیازن ! ئەو جا ئەم ئایەتە هات وفەرمووی: ﴿٧٩ **الذين يلمزون المطوعين من المؤمنين في الصدقات**﴾ ئەو دوو ڕووانەش تەوس و ڕەخنە لەو موسڵمانانەدەگرن کە بە گیان و بە دڵ خێرو صەدەقە ئەکەن ، واتە: کەم بێ یان وۆر، ئەوان ڕەخنەی خۆیان دەگرن و ئەڵێن جائەوە چییە ؟! کەی خوا پێویستی بەوە هەیە ؟!﴿**والذين لا يجدون إلا جهدهم**﴾ وە تەوس لەوانەش دەگرن کە هەرئەوە ﴿**فيسخرون منهم**﴾ بەدەر لەتەوس و تەشەرەکانیان، هێمان گاڵتەشیان پێ دەکەن!﴿**سخرالله منهم**﴾ جا لەبەرامبەر ئەوەوە خوایش مەسخەرە بەوان دەکا ﴿**ولهم عذاب أليم**﴾ وسزایەکی بەئێشیشیان بۆ هەیە .

**هەرگیز داوای لێخۆشبوون بۆ مرۆی دوڕوو مەکە :**

دوو ڕووەکـــان ئەوەنـــد درۆو دەلەســـەیان کـــردووەو بڕووبیانوویـــان بـــەدرۆ هێناوەتـــەوە خـــوا ئەفـــەرموێ: ﴿٨٠ **إســتغفر لهــم او لا تســتغفر لهــم**﴾ داوای لێخۆشـــبوونیان بۆبکـەیت ئـەی پێغەمبـەر!، یـان نەیکـەیت ﴿**إن تســتغفر لهم ســبعين مــرة**﴾ تەنانــەتی ئەگــەر حــەفتاجاریش داوای لێبوردنیـــان بـــۆ بکـــەیت، واتـــە: زۆرتـــر لـــەوە، یـــان کـــەمتر بپاڕێیتەوە بۆیان ﴿**فلن يغفرالله لهم**﴾ خوا هـەر لێیان خۆش نابێت، بەڵکو هەر ئابڕوویان دەباو جەزرەبەش دەخۆن ﴿**ذلك بأنهم كفروا بالله ورسوله**﴾ چوون " هەرلەبنەڕەتدا" باوەڕیان بە خواو بە پەیامبەری خوا نییە، بۆیە ئەوەندە لارو لاسارو درۆزنـــن و، لەســـنوور تێدەپـــەڕن ﴿**والله لايهـــدى القـــوم الفاســـقين**﴾ دڵنیـــابن خـــوا هیدایـــەت و ڕێنمـــایی خـــەڵکانی سنوور بەزێن ناکات بۆ باوەڕهێنان.

الجزء العاشر — سورة التوبة

ٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لَا تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِن تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً
فَلَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ
وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٨٠﴾ فَرِحَ ٱلْمُخَلَّفُونَ
بِمَقْعَدِهِمْ خِلَٰفَ رَسُولِ ٱللَّهِ وَكَرِهُوٓا۟ أَن يُجَٰهِدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ
وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَقَالُوا۟ لَا تَنفِرُوا۟ فِى ٱلْحَرِّ قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ
أَشَدُّ حَرًّا لَّوْ كَانُوا۟ يَفْقَهُونَ ﴿٨١﴾ فَلْيَضْحَكُوا۟ قَلِيلًا وَلْيَبْكُوا۟ كَثِيرًا
جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٨٢﴾ فَإِن رَّجَعَكَ ٱللَّهُ إِلَىٰ طَآئِفَةٍ
مِّنْهُمْ فَٱسْتَـْٔذَنُوكَ لِلْخُرُوجِ فَقُل لَّن تَخْرُجُوا۟ مَعِىَ أَبَدًا وَلَن
تُقَٰتِلُوا۟ مَعِىَ عَدُوًّا إِنَّكُمْ رَضِيتُم بِٱلْقُعُودِ أَوَّلَ مَرَّةٍ فَٱقْعُدُوا۟
مَعَ ٱلْخَٰلِفِينَ ﴿٨٣﴾ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ
عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ إِنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ فَٰسِقُونَ
﴿٨٤﴾ وَلَا تُعْجِبْكَ أَمْوَٰلُهُمْ وَأَوْلَٰدُهُمْ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُعَذِّبَهُم
بِهَا فِى ٱلدُّنْيَا وَتَزْهَقَ أَنفُسُهُمْ وَهُمْ كَٰفِرُونَ ﴿٨٥﴾ وَإِذَآ
أُنزِلَتْ سُورَةٌ أَنْ ءَامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَجَٰهِدُوا۟ مَعَ رَسُولِهِ ٱسْتَـْٔذَنَكَ
أُو۟لُوا۟ ٱلطَّوْلِ مِنْهُمْ وَقَالُوا۟ ذَرْنَا نَكُن مَّعَ ٱلْقَٰعِدِينَ ﴿٨٦﴾

٢٠٠ — رضوان

**دوو ڕووەکان خۆشحاڵن بە لە ماڵەوە بوون :**

﴿٨١ **فرح المخلفون بمقعدهم خلاف رسول الله**﴾ دوو ڕووە –چرووککراوەکان – بەتایبەتی ئەوانەیان لەجەنگی (تەبووک) خۆیان دزیەوە، خۆشحاڵ ودڵشادن بەچرووکبوون و مانەوەیان لەماڵەوەو، لەگەڵ پەیامبەردا دەرنەچوون بۆ تـەبووک ! چونکە پیشەی هـەموو مرۆڤێکی بێ هیممەت هەرئاوایە دەبینی: لـەکاتی تەنگانـەدا خـۆی دەگرێتە دواوەو، واشدەزانێ کارێکی باشیکردووە ﴿**وكرهوا ان يجاهدوا بأموالهم وانفسهم في سبيل الله**﴾ وە پێشیان خۆش نەبوو بە سەروەت و سامان و، بەگیانی خۆیان لەڕێگەی خوادا بچنە خەزاو جیهاد بکەن ﴿**وقالوا لا تنفروا في الحر**﴾ بە یەکتریان دەگوت: لەم کاتی گەرمایەدا دەرمەکەون و مەچن بۆ جەنگ ، دیارە کەجەنگی تـەبووک لە کاتێکی زۆر گـەرماو نارەحەتـدابوو، میـوەی زۆرروو خۆشمـەزە پێگـەیبوو ﴿**قـل نـار جهـنم اشـد حـرا**﴾ پێیـان بڵـێ: ئـەی موحەممـەد! ﷺ ئـاگری دۆزەخ گـەرمترە لەگـەرمای هـاوین ﴿**لـو كـانوا يفقهـون**﴾ ئـەر ژیـروو فامیـدە بوونایـە چـاک

تێدەگەیشتن. جا بۆ پتر روونبوونەوەی ئەو ئاگرە، خوای گەورە لەچەند جێگایەکدا باسی دەکات، بۆنموونە: لە سوورەتی (٦/٦٦)دا دەفەرموێ: (..نارا وقودها الناس والحجارة)، یان لە سوورەتی(٧٠/١٥-١٦)دا دەفەرموێ: (كلا إنها لظى نزاعة للشوى)، یان لە سوورەتی (٥٦/٤)دا دەفەرموێ: (كلما نضجت جلودهم بدلناهم جلودا غيرها..) یان لە سوورەتی (٢٢/١٩-٢١)دا دەفەرموێ: (يصب من فوق رؤوسهم الحميم يصهر به مافي بطونهم والجلود ولهم مقامع من حديد). یان لە سوورەتی (١٨/٢٩)دا هاتووە: (وإن يستغيثوا يغاثوا بماء كالمهل يشوي الوجوه..) یان لە سوورەتی(٤٧/١٥)دا دەفەرموێ:(و سقوا ماء حميما فقطع أمعاءهم). ﴿[٨٢] فليضحكوا قليلا﴾ دەبا لەبەرامبەر ئەو ئاگرە سەختەوە کەم پێبکەنن ﴿وليبكوا كثيرا﴾ و زۆر بگرین، چونکە رۆژی دوایی هەرگیز ناپڕێتەوە لێیان، واتە: هەقنەبوو زۆر پێکەنینیان بووبا ﴿جزاء بما كانوا يكسبون﴾ تاوانی ئەوئاگرە بەوشێوەیە، بۆ تۆڵەو جەزرەبەی ئەوانە، لەبەرامبەر ئەو تاوانانەوە دەیانکردن.

**رێ بە موناڤق نادرێت بچێتە غەزاو، کەمردیش نوێژی لە سەر ناکرێت!**

﴿[٨٣] فإن رجعك الله إلى طائفة منهم﴾ جا کە خوا بردیتیەوە مەدینە، بۆلای دەستەیەک لە موناڤقەکان - لەوانەی نەهاتبوونە تەبووک- دێنە لات ﴿فاستأذنوك للخروج﴾ داوات لێدەکەن مۆڵەتیان بدەیت لەگەڵ تۆ دەرچن و بچن بۆ غەزایەکی تر، واتە: لە نەهاتنەکەی تەبووک پەشیمانن ﴿فقل لن تخرجوا معي أبدا﴾ تۆش لەوەڵامیاندا بڵێ: هەرگیز ناشێ جارێکی تر لەگەڵ من بچنە دەرێ و هاوڕێیەتیم بکەن" بۆ هیچ غەزایەکی تر ﴿ولن تقاتلوا معي عدوا﴾ و ناشکرێ جارێکی تر لەگەڵ مندا بچنە شەڕی هیچ دوژمنێك ﴿إنكم رضيتم بالقعود أول مرة﴾ چونکە ئێوە هەر لەهەوەڵ رۆژەوە رازی بوون بەدانیشتن و، مانەوەی ماڵەوەتان هەڵبژارد ، بۆیە خۆتان دزیەوەو نەهاتن بۆ تەبووک ﴿فاقعدوا مع الخالفين﴾ دە ئێستاش بچن خانەنشین بن و لەگەڵ ژنان و منداڵاندا بۆ خۆتان لەماڵەوە بمێننەوە. لەسوورەتی (٤٨/١١٠) شدا هاتووەو دەفەرموێ: (ونقلب أفئدتهم وأبصارهم كما لم يؤمنوا به أول مرة..) مەبەست ئەمەیە کە خوای گەورە "لەبەر لاسارییان" دڵ و بینایی لەرێی راست لادان. ﴿[٨٤] ولا تصل على أحد منهم مات أبدا﴾ هەرگیز نوێژ لەسەر کەسێ لەو دوو ڕووانە مەکە بمرێ ، چونکە نزاو نوێژی تۆ بۆ ئەوانە، دەبێتە مایەی میهرەبانیی و بارانی بەزەیی خوا، دیارە ئەوانەیش شیاوی ئەو دلۆڤانیی و میهرەبانیە نین ﴿ولا تقم على قبره﴾ و لەسەر گۆڕەکەیشی بە پێوە مەوەستە بۆ داوای گوناح پۆشین و لێبوردن ﴿إنهم كفروا بالله ورسوله﴾ چونکە بەراستیی ئەوانە "بەرلەوە بمرن" حاشایان لە خواو لە پەیامبەرەکەی ئەو کرد ﴿وما توا وهم فاسقون﴾ هەر بەفاسقیی و یاخیانەش مردن ، واتە: ئەو خوا نەسانە لەناو کۆمەڵگەدا نابێ پلەو رێزیان بۆ دابنرێ. بوخاریی لە(ئیبن عەبباس)ەوە دەڵێت: ئەم ئایەتی(ولا تصل على أحد..)، سەبارەت بە کوڕەکەی (سەلوول) هاتە خوارەوە، وەك دەڵێ: (فصلى عليه رسول الله ، ثم انصرف فلم يمكث إلا يسيرا، حتى نزلت الآيتان من ((براءة)) ولا تصل على أحد منهم مات أبدا) واتە: پێغەمبەری خوا نوێژی لەسەر تەرمەکەی (سەلوول)کرد، پاشان زۆری نەخایاند، هەتا ئەو دووئایەتەی (بەرائە) هاتن ورێیان لەوەگرت کەجارێکی تر ئامادەی بەرێکردنی تەرمی هەر کەسێك بێ لەدوو ڕووەکان ، یان نوێژی لەسەربکات، بەڵێ پاش هاتنی ئەو ئایەتانە پێغەمبەر ﷺ هەرگیز دوای تەرمی موشریك و دوو ڕوو نەدەکەوت، و نەدەچوویە سەر گۆری نوێژی لەسەر بکا، چونکە دەبێ ئەوخەڵکە لاسارودژ بەئیسلامە تەمێ بکرێ، مەسەلەی کراسەکەیش ئەگەر کردبێتی بە کوفنی سەلوول، لە بەر ئەوەبوو کاتی خۆی سەلوول کراسێکی خەڵاتی (عەبباس)ی مامی کردبوو، ئەمیش ویستی پاداشتی پیاوەتیەکەی بداتەوە، بەڵام کە ئەو ئایەتانە هاتن،

هەموورئەو شتانە قەدەغە بوون ﴿ ^٨٥ ولا تعجبك أموالهم وأولادهم﴾ نابێ زۆری ماڵ و منداڵیان تۆ سەرسام بکاو، بەلاتەوە شتێکی گرنگ بێت، چونکە ئەوبەخششە لەبەر خۆشەویستیان نییە ﴿إنما يريد الله أن يعذبهم بها فى الدنيا﴾ بەڵکو خوا هەر ئەیەوێ بەو سەروەت وسامانەیان لە دونیادا سزایان بدا ﴿وتزهق انفسهم وهم كافرون﴾ وکاتێ گیانیشیان دەکێشێ بەکافری بمرن ، واتە: لەدنیادا زەکات دەخاتە سەریان، ئەوانیش زۆر بەدڵگرانی دەیدەن و خەفەت وحەسرەتی پێدەخۆن، کە مردیشن کافرن، چونکە ئیمانی راستییان نەبووە.

**ئەمەش چەند خوویەکی تری خۆ دوا خەرانە لە جیهاد:**

﴿ ^٨٦ وإذا أنزلت سورة﴾ هەر کە بەشێك لە قورئان دابەزێنرێ و پێیان بڵێت:﴿أن آمنوا بالله وجاهدوا مع رسوله﴾ کە دەبێ باوەڕ بەخوا بهێنن و لەگەڵ پەیامبەرەکەیدا ﷺ جیهاد بکەن ﴿استأذنك أولوا الطول منهم﴾ بەخێرایی دەست ڕۆیشتووەکانیان دێن داوای مۆڵەتت لێ دەکەن کەنەچنە خەزاکەوە و بڕووبیانوویەك دەهێننەوە، هەتا خۆبشارنەوە!! ﴿وقالوا ذرنا نكن مع القاعدين﴾ دەشڵێن: وازمان لێ بهێنە با لەگەڵ ئەو دانیشتوانەدا لەماڵ دانیشین ، هەروەکو لەچەند جێگایەکی تردا باسی ئەو خووە بەدفەڕەیان دەکات، بۆ نموونە: لە سوورەتی (٩/٤٤-٤٥)دا دەفەرموێ:(لا يستأذنك الذين يؤمنون بالله واليوم الآخر أن يجاهدوا بأموالهم وأنفسهم والله عليم بالمتقين) هەتا دەگاتە (..فهم فى ربهم يترددون) یان لە سوورەتی(١٩/٣٣)دا هاتووە: (فإذا جاء الخوف سلقوكم بألسنة حداد..).

**دوو ڕووەکان کەیف خۆشبوون کە لەگەڵ بەجێماوەکان بوون:**

﴿ ^٨٧ رضوا بأن يكونوا مع الخوالف﴾ ڕازی بوون بەوەی کە لەگەڵ ژن ومنداڵ و پیرو پەك کەوتەکاندابن و، نەچنە جیهاد ﴿وطبع على قلوبهم فهم لا يفقهون﴾ و بەهۆی نکووڵیان لەجیهاد مۆری بەدبەختی نرا بەسەر دڵیانداو هیچ تێناگەن و، نازانن جیهاد چ عیززەتێکی دنیاو قیامەتی تێدایە، بۆیە دانیشتنی ماڵەوەیان لە جیهاد پێ باشترە ! ﴿ ^٨٨ لكن الرسول والذين آمنوا معه﴾ بەڵام پەیامبەرو ئەوانەی لەگەڵ ئەودان و بڕوایان هێناوە ﴿جاهدوا بأموالهم وانفسهم﴾ بەماڵ و سامان و گیانیان جیهاد دەکەن بۆسەرخستنی دینی خوا ﴿وأولئك لهم الخيرات﴾ هەموو خێرو چاکەیەك - لە قیامەتدا- هەر بۆ ئەوانەیە ﴿وأولئك هم المفلحون﴾ وهەر ئەوانیش سەر بڵندو بەختیارن ﴿ ^٨٩ أعد الله لهم جنات﴾ بەدەر لەو سەر بەرزیەیان، خوای میهرەبان چەند باخ و بەهەشتێکی بۆ ئامادە کردوون ﴿تجرى من تحتها الأنها ر﴾ کە لەبن درەخت و کۆشکەکانیانەوە جۆگەو ڕووبار گەلێ دێت ودەچێت ﴿خالدين فيها﴾ بەهەتا هەتاییش لەوێ دەبن ﴿ذلك الفوز العظيم﴾ هەر ئەوەیە دەسکەوتی مەزن و، سەرکەوتنی گەورەو بێ وێنە ﴿ ^٩٠ وجاء المعذرون من الأعراب﴾ وە عارەبە دەشتەکیە خاوەن ئیمان و، بیانوودارەکان هاتنە لات ئەی پێغەمبەر! ﴿ليؤذن لهم﴾

سُورَةُ التَّوبَة — الجزء العاشر

رَضُوا۟ بِأَن يَكُونُوا۟ مَعَ ٱلْخَوَالِفِ وَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ ﴿٨٧﴾ لَٰكِنِ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ جَٰهَدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلْخَيْرَٰتُ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٨٨﴾ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٨٩﴾ وَجَآءَ ٱلْمُعَذِّرُونَ مِنَ ٱلْأَعْرَابِ لِيُؤْذَنَ لَهُمْ وَقَعَدَ ٱلَّذِينَ كَذَبُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ۚ سَيُصِيبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٩٠﴾ لَّيْسَ عَلَى ٱلضُّعَفَآءِ وَلَا عَلَى ٱلْمَرْضَىٰ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ مَا يُنفِقُونَ حَرَجٌ إِذَا نَصَحُوا۟ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۚ مَا عَلَى ٱلْمُحْسِنِينَ مِن سَبِيلٍ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٩١﴾ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ إِذَا مَآ أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ قُلْتَ لَآ أَجِدُ مَآ أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ تَوَلَّوا۟ وَّأَعْيُنُهُمْ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمْعِ حَزَنًا أَلَّا يَجِدُوا۟ مَا يُنفِقُونَ ﴿٩٢﴾ ۞ إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ عَلَى ٱلَّذِينَ يَسْتَـْٔذِنُونَكَ وَهُمْ أَغْنِيَآءُ ۚ رَضُوا۟ بِأَن يَكُونُوا۟ مَعَ ٱلْخَوَالِفِ وَطَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٩٣﴾

٢٠١

هەتا مۆڵەت بدرێن" و نەچنە جیهاد" ﴿وقعد الذين كذبوا الله ورسوله﴾ ئەو درۆزنانەشیان کەلەگەڵ خواو پەیامبەری ئەودا درۆیانکرد– لەئیمان وباوەڕەکەیاندا–، لێیدانیشتن و، گوێی خۆیانیان کەڕکردو، نەهاتن پۆزش و عوزر– بۆ نەهاتنەکەیان – بێننەوە، چونکە ئیمانێکی سەر زارەکیان هەبوو ﴿سيصيب الذين كفروا منهم عذاب اليم﴾ سەر ئەنجام سزایەکی قورس و ئێش پێگەیەنەر، هەر دووچاری بێ باوەڕەکانیان دەبێت .

**ئەمانە جیهادیان لەسەر نیە :**

﴿[٩١] ليس على الضعفاء ولا على المرضى﴾ ئەوکەسانەی بونیەی لەش و جەستەیان لاوازو بێ هێزە، یان لەش بەبارو نەخۆشن ﴿ولا على الذين لايجدون ما ينفقون حرج﴾ وە ئەوانەی هیچیان دەست ناکەوێ بەختی بکەن بۆ خۆ ئامادەکردن بۆچوونە جیهاد، ئەمانە هیچ گوناهێکیان لەسەر نیە دانیشن و نەچنە خەزا ﴿إذا نصحوا لله ورسوله﴾ بەمەرجێ راساڵ و صوڵحاوو دڵسۆزبن بە خواو بەپەیامبەرەکەی و، هانی خەڵکانی تر بدەن بۆ جیهادو، ئەستەم و گرێ لەبەر پێی موسڵمانان‌دا دروست نەکەن و، لەجیهاد پەشیمانیان نەکەنەوە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ما على المحسنين من سبيل﴾ خەڵکانی پۆزشدارو خێرخواز ئەر نەشچنە جیهاد، هیچ رێیەك نیە بۆ سزادانیان، واتە: ئەوانە کە بەئەندازەی دەسەڵاتیان هەوڵدەدەن بۆ چاکەو، خۆشیان نادزنەوە لە خەزا، سووچێکیان نیە ﴿والله غفور رحيم﴾ و خوا گوناحپۆش و لێبوردەیە، دلۆڤان و میهرەبانە، بەپێی دەسەلات وتوانا ئەرك دادەنێت ﴿[٩٢] ولا على الذين إذا ما اتوك لتحملهم﴾ وە لەسەر ئەوانەش جیهاد نیەو گوناحیان ناگات کە نەچنە خەزا : کاتێ هاتنەلات وداوایان کرد کە لەگەڵ خۆت بیانبەیت بۆ جیهادو، وڵاخی سوارییان بۆپەیدا بکەیت ﴿قلت لا اجد مااحملكم عليه﴾ تۆیش گوتت: هیچ شتێك شك نابەم هەڵتانگرێ و سواری ببن ﴿تولوا واعينهم تفيض من الدمع حزنا﴾ ئیتر ئەوانیش بەوحاڵەوە لای تۆ گەڕانەوەو، چاویشیان– لەخەم وخەفەتا– بە لێشاو فرمێسکی دەڕشت ﴿الا يجدوا ما ينفقون﴾ کە شتێکیان نەبوو لەرێی خواو سەرخستنی دینی ئیسلامدا خەرجی بکەن. بەڵێ.. لە دینی ئیسلامدا داواو تەکلیف بەئەندازەی تواناودەسەڵات دەکرێ ، بۆیە خوا لەجێگایەکی تردا هەر لەو بارەوە دەفەرموێ: (لا يكلف الله نفساً إلا وسعها).. یان دەفەرموێ: (ليس على الأعمى حرج ولا على الاعرج حرج..) راستە ئەوکەسانە کە جەستەو لاشەیان کەڵکی چوونە سەربازی پێوە نیە ، ئەوە بێ شك هیچ داوایەکیان لێ ناکرێ بچنە خەزا ، بەڵکو پاداشیشیان هەیە لای خوا، بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (لقد تركتم بالمدينة أقواما ماسرتم مسيرا...) ئەبوو داود / فی الجهاد (٢٥٠٨) باب (٢٠)، والبخاری فی الجهاد: ٢٨٣٩/باب/٣٥. واتە: ئێستا ئێوە لە گۆڕەپانی جیهاددان و، لە (مەدینە)ش خەڵکێك – بەهۆی نەخۆشیی و کەم ئەندامیی و نەبوونیی کەرەسەی جەنگەوە جێماون، دڵنیابن هاوبەشتانن لە بەهەشتدا، چونکە دڵیان لەلاتانەو، ئەگەر بۆیشیان کرابا دەهاتن.

کۆتایی جزمی (١٠) دەیەم

ولله الحمد والمنة

*** *** ***

* ﴿[٩٣] إنما السبیل على الذین یستأذنونك وهم أغنیاء﴾ بەڵکو ڕێ گلەیی و گازندەو تۆڵە تەنها لەسەر ئەوانەیە کە داراو دەوڵەمەندن و، دێن داوای مۆڵەتت لێ دەکەن نەچنە جیهاد ﴿رضوا بأن یکونوا مع الخوالف﴾ ڕازی بوون لەگەڵ بەجێماوەکان بن و، لەماڵەوە بنەبخەن و لەگەڵتان نەیەن !! ﴿وطبع الله على قلوبهم﴾ ئەوساش لەبەر ئەوە خوای گەورە مۆری بەدبەختیی بەسەر دڵیاندا نا ﴿فهم لا یعلمون﴾ ئیتر لەپاشە ڕۆژی خراپی خۆیشیان نازانن و بەهۆشنایەنەوە ﴿[٩٤] یعتذرون إلیکم إذا رجعتم إلیهم﴾ هەر کە لە غەزای تەبووك گەڕانەوە بۆ لایان ، بەپەلە دێن و دەست دەکەنە بڕوو بیانوو هێنانەوە بۆتان ﴿قل لا تعتذروا﴾ بڵێ: هیچ بڕووبیانوویەك مەهێننەوە ﴿لن نؤمن لکم﴾ چونکە چاك دەتانناسین و هەرگیز بڕواتان پێ ناکەین ﴿قد نبأنا الله من أخبارکم﴾ بەهەقیقەت خوای گەورە لە دەنگوباس و هەواڵە نهێنیەکانتانی ئاگادار کردین، واتە: تێیگەیاندین کە چ شتێك لە دڵتاندایە ﴿وسیری الله عملکم ورسوله﴾ بۆئایینەدەش بە تەئکید خواو پەیامبەری خوا، گشت کردەوەکانتان دەبینن، واتە:خواو پێغەمبەرەکەی دەزانن چ کارێکتان لێدەوەشێتەوە لەمە بەدوا ؟ ﴿ثم تردون إلى عالم الغیب والشهادة﴾ لە پاشان دەبرێنەوە لای ئەو زانایە کە بەهەموو نادیارو دیارێك ئەزانێ و ئاگادارە ﴿فینبئکم بما کنتم تعملون﴾ ئینجا هەرشتێکتان کردووە ئاگادارتان ئەکات لێی.

**فرت و فێڵی دووڕووەکان:**

﴿[٩٥] سیحلفون بالله لکم إذا انقلبتم إلیهم﴾ هەر کە لەتەبووك هاتنەوە لایان، خێرا دێن و بەخوا سوێندتان بۆ دەخۆن کە: توانای هاتنمان نەبوو لەگەڵتاندا بیینە خەزاکە بۆیە نەهاتیین ﴿لتعرضوا عنهم﴾ هەتا وازیان لێ بهێنن" و ناویان نەبەن" ﴿فأعرضوا عنهم﴾ دەسا وازیان لێ بهێنن و وێڵیان بکەن و مەیاندوێنن و نرخیان بۆ دامەنێن ﴿إنهم رجس﴾ چونکە خۆیان و کارو کردەوەیان پیس و ناپاکە ﴿و مأواهم جهنم﴾ وجێ و شوێنیان ئاگری دۆزەخە ﴿جزاء بما کانوا یکسبون﴾ ئەم تۆڵەیانە لەبەر ئەوکارو کردەوەیە کردوویانە ﴿[٩٦] یحلفون لکم لترضوا عنهم﴾ سوێندتان بۆ دەخۆن هەتا ڕازییبن لێیان ﴿فإن ترضوا عنهم﴾ خۆ ئەر لێشیان ڕازیی ببن ﴿فإن الله لا یرضى عن القوم الفاسقین﴾ ئەوە بێگومان خوا لەخەڵکانی سنوور بەزێن ڕازی نابێت، کوڕەکەی (سەلوول)هەر کە پێغەمبەر گەڕایەوە هات سوێندی بۆخوارد کە: جارێکی تر دواناکەوێت.

**دەشتەکی بێ ڕەزاترو کوڵی ترن:**

﴿[٩٧] الأعراب أشد کفرا ونفاقا﴾ عەرەبە دەشتەکییەکانی دەرەوەی مەدینە، لەمەڕ بێ باوەڕیی و دوو ڕوویییەوە لەخەڵکانی تر سەر سەختن ﴿واجدر أن لا یعلموا حدود ما انزل الله على رسوله﴾ شایستەو لەبار تریشن بە نەزانینی سنووری ئەو یاسایانەی خوا ناردوونی بۆ پەیامبەرەکەی ﴿والله علیم حکیم﴾ وە خوا بەهەموو ئیش و

الجزء الحادي عشر — سورة التوبة

يَعْتَذِرُونَ إِلَيْكُمْ إِذَا رَجَعْتُمْ إِلَيْهِمْ ۚ قُل لَّا تَعْتَذِرُوا
لَن نُّؤْمِنَ لَكُمْ قَدْ نَبَّأَنَا اللَّهُ مِنْ أَخْبَارِكُمْ ۚ وَسَيَرَى
اللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَىٰ عَالِمِ الْغَيْبِ
وَالشَّهَادَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٩٤﴾ سَيَحْلِفُونَ
بِاللَّهِ لَكُمْ إِذَا انقَلَبْتُمْ إِلَيْهِمْ لِتُعْرِضُوا عَنْهُمْ ۖ فَأَعْرِضُوا
عَنْهُمْ ۖ إِنَّهُمْ رِجْسٌ ۖ وَمَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ جَزَاءً بِمَا كَانُوا
يَكْسِبُونَ ﴿٩٥﴾ يَحْلِفُونَ لَكُمْ لِتَرْضَوْا عَنْهُمْ ۖ فَإِن
تَرْضَوْا عَنْهُمْ فَإِنَّ اللَّهَ لَا يَرْضَىٰ عَنِ الْقَوْمِ الْفَاسِقِينَ
﴿٩٦﴾ الْأَعْرَابُ أَشَدُّ كُفْرًا وَنِفَاقًا وَأَجْدَرُ أَلَّا يَعْلَمُوا
حُدُودَ مَا أَنزَلَ اللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِ ۗ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٩٧﴾ وَمِنَ
الْأَعْرَابِ مَن يَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ مَغْرَمًا وَيَتَرَبَّصُ بِكُمُ الدَّوَائِرَ ۚ
عَلَيْهِمْ دَائِرَةُ السَّوْءِ ۗ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٩٨﴾ وَمِنَ
الْأَعْرَابِ مَن يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَيَتَّخِذُ
مَا يُنفِقُ قُرُبَاتٍ عِندَ اللَّهِ وَصَلَوَاتِ الرَّسُولِ ۚ أَلَا إِنَّهَا قُرْبَةٌ
لَّهُمْ ۚ سَيُدْخِلُهُمُ اللَّهُ فِي رَحْمَتِهِ ۗ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٩٩﴾

٢٠٢ — وَالسَّابِقُونَ

کاریٚ زانایە، لەکارزان و کاردروستە، پێغەمبەریش فەرمووی: ((من سكن البادية جفا، ومن اتبع الصيد غفل، ومن أتى السلطان افتتن)) پێشەوا ئەحمەد. واتە: مرۆڤی دەشتەکی دڵڕەقە، پیاوی ڕاوچی خافڵ و بیٚ ئاگایە، هاتووچۆکەری لای (سوڵتان)، تووشی ئازار دەبێت .مسند ٣٥٧/١ . هەرلەبەر ئەمەیشە کە تەنیا لەناو شارنشینەکاندا پێغەمبەران ڕەوانە کراون، وەکو ئایەتی: (وما أرسلنا من قبلك إلا رجالا نوحي إليهم من أهل القرى..) ئەو ڕاستیە دەسەلمێنیٚ ﴿[٩٨] ومن الأعراب من يتخذ ما ينفق مغرما﴾ لە عەرەبە دەشتەکییەکان هەیە: کەهەرچی لەڕێگەی خوادا بدات، بەزیان و (غەرامە) ی دادەنیٚ، چونکە لەدڵەوە نایکاو بڕوای پێی نیە ﴿ويتربص بكم الدوائر﴾ و سەرەڕای ئەوەیش هەر چاوەڕوانن بەڵاو نەهاتێکتان بەسەرا بیٚ!! ﴿عليهم دائرة السوء﴾ یاخوا بەڵا و تێشکان هەر بەسەر خۆیاندا بیٚ ﴿والله سميع عليم﴾ خوا ژنەوایە، بەقسە نابەجێکانیان، زانایە بەوەی دەیکەن ودەیڵێن ﴿[٩٩] ومن الأعراب من يؤمن بالله واليوم الآخر﴾ هەیشیانە بەباشی باوەڕی بەخواو بەڕۆژی دوایی هەیە ﴿ويتخذ ما ينفق قربات عند الله وصلوات الرسول﴾ و هەرچیش لەو ڕێیەدا ببەخشیٚ بە نزیکبوونەوەی خواو، بەمایە دۆعاو داوای لێبوردنی پێغەمبەری دادەنێت ﴿ألا إنها قربة لهم﴾ بەڵیٚ.. بزانن! بێگومان ئەو بەخشینە نزیکبوونەوەیەکە بەخواوە بۆیان ﴿سيدخلهم الله في رحمته﴾ و خواش هەر دەیەنخاتە بەر بەزەیی و میهرەبانی خۆیەوە ﴿إن الله غفور رحيم﴾ چونکە خوا زۆر لێبوردەیە، زۆر دلۆڤانە.

**فەزڵی کۆچبەران و پشتیوانان و شوێنکەوتوانیان:**

ئینجا سەرەی باسکردنی کۆمەڵی (ئەنصار) و کۆچکەرانە بۆیە دەفەرمویٚ: ﴿[١٠٠] والسابقون الأولون من المهاجرين والأنصار﴾ لە دەستەی یەکەمی پێشەنگی کۆچکەران و پشتیوانان ﴿والذين اتبعوهم بإحسان﴾ و چاك پەیڕەوانی ئەوانییش ﴿رضي الله عنهم﴾ خوا ڕازیی بوو لێیان ﴿ورضوا عنه﴾ و ئەوانیش لە خوا ڕازییبوون. لەچەند جێگایەکی تردا ئەو فەزڵ و ڕێزو حورمەتە هاتووە ، بۆنموونە: لەسوورەتی (٣/٦٢)دا دەفەرمویٚ: (وآخرين منهم لما يلحقوا بهم..) یان لەسوورەتی (١٠/٥٩)دا دەفەرمویٚ: (والذين جاؤوا من بعدهم يقولون ربنا اغفر لنا ولإخواننا..) ، یان لە سوورەتی (٧٥/٨)دا دەفەرمویٚ: (والذين آمنوا من بعد وهاجروا وجاهدوا معكم فأولئك منكم..) بیٚ لەمەش ئەوەمان دەست دەخەن کە: (تابيعين) و پاشینانی ئەوانە، وەك پێشینانیان حیسابیان بۆدەکریٚ و، ڕەزامەندی خوا بەدەست دێنن ﴿وأعد لهم جنات تجري تحتها الأنهار﴾ بەدەر لەوەش چەندان باخ و بێستانی بۆ سازداون کە: بە بەر درەخت و کۆشکەکانییدا ڕوبار گەڵێ دەچێت ﴿خالدين فيها أبدا﴾ بە هەتا هەتاییش تێیدا دەمێننەوە ﴿ذلك الفوز العظيم﴾ هەر ئەوەیشە دەسکەوت و سەرفرازیی گەورەو بەنرخ. (سەعیدی کوڕی موسەیەب)

الجزء الحادي عشر — سورة التوبة

وَالسَّٰبِقُونَ الْأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَٰجِرِينَ وَالْأَنصَارِ وَالَّذِينَ
اتَّبَعُوهُم بِإِحْسَٰنٍ رَّضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ وَأَعَدَّ
لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا الْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا أَبَدًا
ذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴿١٠٠﴾ وَمِمَّنْ حَوْلَكُم مِّنَ الْأَعْرَابِ
مُنَٰفِقُونَ وَمِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ مَرَدُوا عَلَى النِّفَاقِ لَا تَعْلَمُهُمْ
نَحْنُ نَعْلَمُهُمْ سَنُعَذِّبُهُم مَّرَّتَيْنِ ثُمَّ يُرَدُّونَ إِلَىٰ عَذَابٍ
عَظِيمٍ ﴿١٠١﴾ وَءَاخَرُونَ اعْتَرَفُوا بِذُنُوبِهِمْ خَلَطُوا عَمَلًا صَٰلِحًا
وَءَاخَرَ سَيِّئًا عَسَى اللَّهُ أَن يَتُوبَ عَلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٠٢﴾
خُذْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ عَلَيْهِمْ
إِنَّ صَلَوٰتَكَ سَكَنٌ لَّهُمْ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٠٣﴾ أَلَمْ يَعْلَمُوا
أَنَّ اللَّهَ هُوَ يَقْبَلُ التَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِ وَيَأْخُذُ الصَّدَقَٰتِ وَأَنَّ
اللَّهَ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ ﴿١٠٤﴾ وَقُلِ اعْمَلُوا فَسَيَرَى اللَّهُ عَمَلَكُمْ
وَرَسُولُهُ وَالْمُؤْمِنُونَ وَسَتُرَدُّونَ إِلَىٰ عَٰلِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَٰدَةِ
فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٠٥﴾ وَءَاخَرُونَ مُرْجَوْنَ لِأَمْرِ
اللَّهِ إِمَّا يُعَذِّبُهُمْ وَإِمَّا يَتُوبُ عَلَيْهِمْ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١٠٦﴾

٢٠٣

و دەستەیەکی تر لەپێناسەی (سابقین)دا دەڵێن: (هم الذین صلوا الی القبلتین). ئەوانە بوون کە لەنوێژەکەدا روویان لەهەردوو قیبلەکە کرد. ئیمامی شافیعیی و یارانیشی دەڵێن: (هم الذین شهدوا بیعة الرضوان). ئەوانە بوون لە (بەیعەتولریزوان)دا ئامادەبوون، دەسا واوەیلاو ئۆف بۆ ئەوانەی رکیان لەو کەسانەیە کەخوا رازییە لێیان و ئەوانیش لەخوا رازین! بێ لەوەیش هێشتا جنێویان دەدەنێ و تەکفیریان دەکەن !!.

## دوو ڕووەکانی ( مەدینە )و دەشتەکییەکان :

﴿ ١٠١ وممن حولكم من الأعراب منافقون﴾ لەعەرەبە دەشتەکییەکانی دەوروبەریشتاندا خەڵکێکی دوو ڕوو و مونافیق هەیە، وەکو هۆزی (موزەینە ،ئەسلەم، غیفار، ئەشجەع) ﴿ومن اهل المدینة مردوا علی النفاق﴾ وە لە خەڵکانی (مەدینە)شدا هەندێکی دووڕوو و، لێبڕاو بۆ دووڕوویی هەن ﴿لا تعلمهم نحن نعلمهم﴾ تۆ ئەی موحەممەد نایانناسی، هەتا لەم دنیایەدا بڕیاری خۆتیانی لەسەر بدەیت، ئێمە بۆخۆمان زۆرباش دەیانناسین ﴿سنعذبهم مرتین﴾ جا لەبەر ئەوە ئێمە لەدنیادا دووجار سزایان ئەدەین، جارێکیان بە سەرخستنتان بە سەر دوژمنەکانتاندا کە بەوە دڵگران دەبن، جارێکیشیان بە ئابڕو بردنیان ونیفاقیان ﴿ثم یردون إلی عذاب عظیم﴾ لە دواییشدا ئەبرێنەوە بۆ جەزرەبەو سزایەکی هەرە گەورە.

## موسڵمانە بەجێماوەکان لەجیهاد :

﴿ ١٠٢ وآخرون اعترفوا بذنوبهم﴾ بڕێ خەڵکی تریش هەیە ددانیان بە گوناهو هەڵەکانی خۆیاندا نا، کە لە خەزای تەبووک "لەبەر سستی خۆیان دواکەوتن" پاشان تەوبەیان کردوو پەشیمان بوونەوە ﴿خلطوا عملا صالحا وآخر سیئا﴾ هەندێ کارو کردەوەی چاکیان ئەنجامداو ، بڕێکی خراپیان تێکەڵکرد ﴿عسی الله ان یتوب علیهم﴾ بێگومان خوا لێیان خۆش دەبێ و، تەوبەیان لێوەردەگرێت ﴿إن الله غفور رحیم﴾ بە ڕاستیی خوا بۆ گوناه زۆر لێبوردەیە ، زۆریش میهرەبان و دلۆڤانە. بەڵێ.. گەلێ ریوایەت هەیە لەسەر ئەوکەسانە دەدوێ و، دیارییان دەکەن و هەریەکە بۆخۆی شتێکی لێ دەڵێت! بەلام لەگەڵ ئەوەیشدا هەموو جۆرە موسڵمانێك بەردەکەوێ کەئەویش کاروکردەوەی بەوچەشنە بێت و، پاشان تەوبە بکات، بۆیە هەرکە (ئەبوو ئەوفا) صەدەقەکەی خۆی هێنا، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (اللهم صل علی آل أبی أوفی) موسلیم. خوایە لە خانەوادەی (ئەبو ئەوفا) ببوریت و رەحمەتیان بەسەرا برێژیت.

## لە سامان و داراییدا زەکات هەیە :

﴿ ١٠٣ خذ من أموالهم صدقة﴾ لە سامانەکەیان زەکات و صەدەقەیە وەرگرە ﴿تطهرهم وتزکیهم بها﴾ دڵ ودەروونیانی پێ پاکەوەکە ، هەتا لە گوناهەکانیان پاك ببنەوەو، چاکەکانیان فراوان ببێ و دەشگەنە پلەی هەرە بەرز ﴿وصل علیهم إن صلاتك سكن لهم﴾ ودۆعای چاکیان دەرهەق بۆبکە، چونکە دۆعا ونزای تۆ ،دڵئارامیی وئۆقرە بەخشە بۆیان ﴿والله سمیع علیم﴾ و خواش زۆر بیسندەیە، زۆریش زانایە. ئەم ئایەتە- ئەگەرچی رووی لەخەڵکە دواکەوتووەکە بێت لە(تەبووک)- بەلام گشتییەو گشتگیرەو تەواوی موسڵمانان دەگرێتەوەو، دەبێ هەتا رۆژی قیامەت" بەشێ لەماڵ و سامانیان ببەخشن بۆ رێی خوا ﴿ ١٠٤ الم یعلموا أن الله هو یقبل التوبة عن عباده﴾ ئاخۆ نەیانزانیبێ کە بێگومان خوا تەوبەو پەشیمانی لە گشت بەندەکانی خۆی قەبووڵ دەکا ﴿ویأخذ الصدقات﴾ وصەدەقەش لە هەموو بڕواداران و دڵسۆزان وەردەگرێ ﴿وان الله هو التواب الرحیم﴾ بێگومان هەر خوایە تەوبە قوبووڵکارو، میهرەبان و دلۆڤان ، دەسا ئێوەیش "ئەی موسڵمانان" تەوبە بکەن و خێرو صەدەقە بدەن بۆ رێی خوا،

پێغەمبەری خوا دەفەرموێ((إن الله يقبل الصدقة ويأخذها بيمينه فيربيها لأحدكم، كمايربى أحدكم مهره، حتى أن اللقمة لتصير مثل أحد)) ترمزیی. واتە: بێگومانە کە خوای میهرەبان صەدەقە قبولْ دەکاو بەدەستی ڕاستیشی وەریدەگرێ و، گەورەی دەکا، هەروەکو چۆن یەکێ لە ئێوە جوان ئەسپەکەی بەخێو دەکاو گەورە دەبێ، تەنانەتی یەك پارو لای خوا بەقەد (ئوحود)ی لێدێ.

**هەڕەشە لەیاخییان:**

﴿[١٠٥] وقل اعملوا فسيرى الله عملكم ورسوله والمؤمنون﴾ ئەی پێغەمبەر! بە هەموو ئەوخەڵکە بڵێ: کاری خۆتان بکەن، بێگومانبن کە خوای گەورەو، پێغەمبەرەکەیی و، موسڵمانان بەرهەمی کردەوەکانتان دەبینن ، واتە: هەر شتێ بکەن خوا پێغەمبەرو ئیماندارانی لێ بەئاگا دەکات، هەر چەند بەدزیی و بەنهێنیش بیکەن ﴿وستردون إلى عالم الغيب والشهادة﴾ و بە تەئکید دەبرێنەوە لای (خوای) زانای نادیارو دیار ﴿فينبئكم بما كنتم تعملون﴾ ئەوسا بەهەر کارێ کردوتانە ئاگادارتان ئەکات.

**کاروباری سێ هاوەڵە بەجێماوەکان لەجیهاد:**

﴿[١٠٦] وآخرون مرجون لأمرالله﴾ و دەستەیەکی تری جێماوەکان ، چاوەڕیی فەرمانی خوان و چارەنووسیان دوا خراوە. ڕاڤەکەرانی قورئان دەڵێن: ئەمانە، ئەو سێ کەسە بوون کە لەخەزای تەبووك خۆیان بەئەنقەست دواخست و نەچوونە خەزاکە. (ئیبن عەبباس) دەڵێ: ئەو سێ کەسەیە:(کەعب)و (هیلال)و (موراره) بوون، دەسی دەسیەکی زۆریان بە خۆیانکرد بۆ چوونە تەبووك، بەڵام دەرەنجام هەر نەچوون ونەچوون!! شایەنی باسە هەر سێ کەسەکەش لە ئەهلی بەدر بوون" ئینجا لەبەر ئەوە پەیامبەرﷺ ڕێی لە هاوەڵان گرت لەقسەو سڵاو لێکردنیان، هەتا فەرمانی خوایان بۆ هات و تەوبەیان لێوەرگیرا، وەکو لەجێیەکی تری ئەم سوورەتەدا خوا دەفەرموێ: (وعلى الثلاثة الذين خلفوا حتى إذا ضاقت عليهم الارض بمارحبت..) ﴿إما يعذبهم وإما يتوب عليهم﴾ ئەنجامیان دواخراوە، جا یاخوا سزایان دەدات، یان تەوبەیان لێ وەردەگرێ ﴿والله عليم حكيم﴾ وە خواش زۆر زانایە، زۆریش کار بەجێ و لە کارزانە، جابۆ دوایی خوای گەورە تەوبەی لێوەرگرتن و فەرمووی: (لقد تاب الله على النبى والمهاجرين والأنصار..).

**مزگەوتی ( ضرار )و بەسەر هاتی:**

﴿[١٠٧] والذين اتخذوا مسجدا ضرارا وكفرا وتفريقا بين المؤمنين﴾ وە لە دووڕووەکاندا کەسانێ وا هەن وەکو (ئەبووعامیری ڕاهیبی عیسایی)- کە لەمەدینەدا -دژ بە پێغەمبەرو موسڵمانان و، بۆ بەهێز کردنی کوفرو بێ باوەڕیی خۆیان و، بۆپەرتکردنی ڕیزەکانی کۆمەڵی باوەڕداران ودوورخستنەوەیان لەپێغەمبەر ﷺ ﴿وارصادا لمن حارب الله ورسوله من قبل﴾ و بۆ ئەوە بیکەنە (کەمین) و ڕوانگە بۆ ئەو کەسانە کەپێشتر بەر لەدروسکردنییدا دژی خواو پەیامبەرەکەی دەجەنگان. دەگێڕنەوە کە (ئەبووعامر)ی فاسق هەمیشە هەڕەشەی لەپەیامبەری خوا دەکرد کە: بەهەموو هێزێکی دژایەتی بکاو، هەرکەسێکیش شەڕی لەگەڵ بکات ئەم ئامادە دەبێت هاوکاری بکات! جا بەفەرمانی ئەو دژو نەیارەی پێغەمبەرە ئەو مزگەوتەیە کرایەوە، هەتا ببێتە جێگای پیلان و فاك و فیك دژ بەموسڵمانەکان ﴿وليحلفن إن أردنا إلا الحسنى﴾ کەچی بەهەموو هێزێکیان سوێند دەخۆن کە: تەنها چاکەوخێرمان لەکردنەوەی ئەو مزگەوتەدا مەبەست بووە ﴿والله يشهد إنهم لكاذبون﴾ خۆ خوا بۆخۆی چاك بەئاگایەکە درۆزنن و دڵیشیان چی تێدایە و، مەبەستیشیان چی بووە؟ ﴿[١٠٨] لا تقم فيه ابدا﴾ هەرگیز تۆش- ئەی پێغەمبەر! - لە

مزگەوتی وادا ڕامەوەستەو نوێژ مەکە ﴿لمسجد اسس على التقوى من اول يوم﴾ دڵنیابە ئەو مزگەوتەیە "مزگەوتی قباء" کە هەر یەکەم ڕۆژ لەسەر بناغەی تەقوا دامەزرا ﴿احق ان تقوم فيه﴾ بەهەقترە تۆ نوێژی تیا بکەیت، هەتا مزگەوتی (ضیرار) ﴿فيه رجال يحبون ان يتطهروا﴾ لەم مزگەوتەدا کۆمەڵە پیاوێکی تێدایە - لە پشتیوانان - زۆر حەزیانە لەهەموو چڵك و چەپەڵیەك و، لەهەر تاوان و گوناهێك پاك ببنەوە ﴿والله يحب المتطهرين﴾ دیارە خواش بۆخۆی پاکانی خۆش دەوێ ﴿١٠٩ افمن اسس بنيانه على تقوى من الله ورضوان خير﴾ ئاخۆ ئەوەی بنەڕەتی مزگەوتەکەی خۆی لەسەر خواناسین و تەقواو ڕەزامەندیی خوادارشتبێ "وەکو مزگەوتی قوبا" چاکترە ﴿ام من اسس بنيانه على شفا جرف هار﴾ یان ئەو کەسەی کە بنەڕەتی مزگەوتەکەی لەسەر لێواری ئاودڕی فشەڵ و روخەك داناوە، دیوارێك لەسەر قوڕێ کرابێ لافاو هێنابێتی و، بەرەو رووخان ملی نابێت، ئەبێ چۆن بینایەکی لەسەر بکرێت؟! ﴿فانهار به فى نار جهنم﴾ ئینجا لەناکاو بەوفشەڵ و رووخەکەوە دەکەوێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە. واتە: ئایا کەسێك بناغەی ئایینی خۆی لەسەر دڵسۆزی وتەقوا دارشتبێ، وەکو کەسێك دەبێ کە لەسەر پروپالانتەو دوو ڕوویی دایرشتبێ؟ ﴿والله لا يهدى القوم الظالمين﴾ هەرگیز خواش ڕێنمایی خەڵکانی ستەمکار ناکات، واتە: ئەوانەی ئەو مزگەوتی (ضیرار)یان کردەوە،ناهەقییکارو ستەمکارن ﴿١١٠ لا يزال بنيانهم الذى بنوا ريبة فى قلوبهم﴾ بینایەکەیان ، واتە: مزگەوتی (ضیرار) کە بەو نیازەوە دروستیانکرد، هەمیشە چاوگی بیم وترسە لەدڵیاندا ﴿الا ان تقطع قلوبهم﴾ لێشیان نابڕێت مەگەر دڵیان لەت لەت ببێ و بمرن ﴿والله عليم حكيم﴾ وە خواش زۆر زانایە، زۆریش کارزان و کار بەجێیە.

**خوا بە بەهەشت گیان و سامانی موسڵمانانی کڕی:**

﴿١١١ إن الله اشترى من المؤمنين انفسهم واموالهم﴾ بێگومان خواگیان سامانی موسڵمانانی کڕیوە ﴿بأن لهم الجنة﴾ کە لە باتییاندا بەهەشتیان بداتێ ﴿يقاتلون فى سبيل الله﴾ کوشتار دەکەن لە ڕێی خوادا ﴿فيقتلون ويقتلون﴾ جا ئەکوژن و، دەشکوژرێن ﴿وعدا عليه حقا﴾ ئەو کڕین و فرۆشتنە بەڵێنێکی هەقە خوای گەورە داویەتی ﴿فى التوراة والإنجيل والقرآن﴾ لە تەورات و ئینجیل وقورئاندا ﴿ومن اوفى بعهده من الله﴾ ئەوە کێ لەخوا پابەند ترە بەپەیمان وبەڵێنی خۆیەوە؟ ﴿فاستبشروا ببيعكم الذى بايعتم به﴾ دەسا مۆژدەو مزگێنی بە یەکتر بدەن و، گشتان دڵشادبن- ئەی موسڵمانان!- بەوکڕین و فرۆشتنەی کردووتانە ﴿وذلك هوالفوز العظيم﴾ دیارە هەر ئەو مامەڵەیە دەسکەوتی مەزن و سەرفرازیی گەورەیە ﴿١١٢ التائبون العابدون الحامدون﴾ ئەو بڕوادارانە کەخوای گەورە ئەوکڕین و فرۆشتنەی لەگەڵ کردوون ، ئەمانەن وەکو خۆی دەفەرموێ: لە ڕابردووی خراپی خۆیان پەشیمانن، عابیدو خواپەرستن، شوکرانە بژێرو سوپاسگوزارن

الجزء الحادي عشر — سورة التوبة

وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مَسۡجِدٗا ضِرَارٗا وَكُفۡرٗا وَتَفۡرِيقَۢا بَيۡنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَإِرۡصَادٗا لِّمَنۡ حَارَبَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ مِن قَبۡلُۚ وَلَيَحۡلِفُنَّ إِنۡ أَرَدۡنَآ إِلَّا ٱلۡحُسۡنَىٰۖ وَٱللَّهُ يَشۡهَدُ إِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ ﴿١٠٧﴾ لَا تَقُمۡ فِيهِ أَبَدٗاۚ لَّمَسۡجِدٌ أُسِّسَ عَلَى ٱلتَّقۡوَىٰ مِنۡ أَوَّلِ يَوۡمٍ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِۚ فِيهِ رِجَالٞ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُواْۚ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُطَّهِّرِينَ ﴿١٠٨﴾ أَفَمَنۡ أَسَّسَ بُنۡيَٰنَهُۥ عَلَىٰ تَقۡوَىٰ مِنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٍ خَيۡرٌ أَم مَّنۡ أَسَّسَ بُنۡيَٰنَهُۥ عَلَىٰ شَفَا جُرُفٍ هَارٖ فَٱنۡهَارَ بِهِۦ فِي نَارِ جَهَنَّمَۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠٩﴾ لَا يَزَالُ بُنۡيَٰنُهُمُ ٱلَّذِي بَنَوۡاْ رِيبَةٗ فِي قُلُوبِهِمۡ إِلَّآ أَن تَقَطَّعَ قُلُوبُهُمۡۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١١٠﴾ ۞إِنَّ ٱللَّهَ ٱشۡتَرَىٰ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَنفُسَهُمۡ وَأَمۡوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلۡجَنَّةَۚ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَيَقۡتُلُونَ وَيُقۡتَلُونَۖ وَعۡدًا عَلَيۡهِ حَقّٗا فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَٱلۡإِنجِيلِ وَٱلۡقُرۡءَانِۚ وَمَنۡ أَوۡفَىٰ بِعَهۡدِهِۦ مِنَ ٱللَّهِۚ فَٱسۡتَبۡشِرُواْ بِبَيۡعِكُمُ ٱلَّذِي بَايَعۡتُم بِهِۦۚ وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿١١١﴾

ربع الحزب ٢١

٢٠٤ التَّٰٓئِبُونَ

﴿السائحون الراكعون الساجدون﴾ و رۆژو گرو جیهادکارن ، روکوع بەرو کرنووش بەرن ﴿الآمرون بالمعروف﴾ و فەرمان دەرن بە چاکە ﴿والناهون عن المنكر﴾ و رێگرن لەخراپە ﴿والحافظون لحدود الله﴾ و پارێزەرن بۆ سنوورەکانی خوا، ئەمانەن لەگەڵ خوادا مامەڵەی بەهەشتیان کردووەو بەهەشتین ﴿وبشر المؤمنين﴾ دەسا تۆش- ئەی موحەممەد!- ئەو مزگێنییە بدە بەو باوەڕدارانە ﴿[113] ماكان للنبى والذين آمنوا أن يستغفروا للمشركين﴾ نە بە پەیامبەر رێدراوە داوای لێبوردن بۆ هاوبەش دانەران بکات، نە بەباوەڕدارانیش ﴿ولو كانوا أولى قربى﴾ ئەگەر چی خزمی نزیکیشیان بن ﴿من بعد ماتبين لهم أنهم أصحاب الجحيم﴾ بەتایبەتی پاش ئەوە بۆیان دەرکەوتووە کە دۆزەخیین و بۆکوفر کار دەکەن. ئیمامی (بوخاریی) دەڵێ: ئەم ئایەتە سەبارەت بە (ئەبوو تالیب) هاتە خوارێ، ئەو دەمە کە لەگیانەڵادا بوو و دەستەیەکیش لە سەرانی قورەیش لەوێ ئامادە بوون، پێغەمبەریش چوویە لای سەریی وفەرمووی: مامە! بڵێ: (لاإله إلا الله) ئەوسا منیش لای خوا ئەیکەمە بەڵگە بۆت ، (ئەبوو جەهل) پڕیدایەو گوتی: ئەبوو تالیب! خەریکە واز لە ئایینی (عبدالمطلب) دێنی؟! پەیامبەر ﷺ فەرمووی: سوێند بەخوا هەتا رێم لێ نەگیرێ، هەر داوای لێبوردنت بۆ ئەکەم. هەر لەوبارەوە بوو ئەم ئایەتەیش هات و فەرمووی: (إنك لاتهدى من أحببت ولكن الله يهدى من يشاء وهو أعلم بالمهتدين) قصص/٥٦.

**لێخۆشبوون بۆ موشریکان داواناکرێ:**

﴿[114] وما كان استغفار إبراهيم لأبيه﴾ خۆ داوا کردنەکەی ئیبراهیمیش بۆ لێخۆشبوون لە باوکی ﴿إلا عن موعده وعدها إياه﴾ تەنها لەبەر ئەوەبوو کە کاتێ خۆی- پێش ئەوە بێ باوەڕیی باوکی بۆ دەرکەوێ- بەڵێنی دابوویە کە: داوای لێبوردنی بۆ بکات، وەکو بەئاشکرا لە سوورەتی (مەریەم)و، ئایەتی(٤٧)دا باسکراوەو دەفەرموێ: (قال سلام عليك سأستغفرلك ربى إنه كان بى حفيا) ﴿فلما تبين له أنه عدولله﴾ جا کە زانی سوور دوژمنی خوایە ﴿تبرامنه﴾ یەخەی لێ هەڵتەکان و بەرائەتی لێکرد ﴿إن إبراهيم لأواه حليم﴾ چونکە ئیبراهیم پیاوێکی زۆر ملکەچ و دەس بە دۆعاو، هێمن و لەسەرخۆ بوو بەرامبەر بە خەڵکانی نەزان .

**سەرنج:** ئەم دووئایەتە (١١٣ و ١١٤) گەورەترین یاسای وەلاو بەرای لە خۆگرتووە و دەبێت مرۆی موسڵمان لە رۆژانەی خۆیدا جێبەجێی بکات ، وە بەهیچ شێوەیەك نابێت خۆشەویستیی و پشتگیری و دۆعای خێر بۆ هیچ کەس و لایەنێك بکات ئەگەر بێتوو دژایەتیی ئیسلام و ئەهلی ئیسلامیی دەکرد ، تەنانەتی ئەگەر ئەو کەس و لایەنانە باوك و براو نزیکترین کەست بوون .

الجزء الحادي عشر — سورة التوبة

ٱلتَّٰٓئِبُونَ ٱلۡعَٰبِدُونَ ٱلۡحَٰمِدُونَ ٱلسَّٰٓئِحُونَ
ٱلرَّٰكِعُونَ ٱلسَّٰجِدُونَ ٱلۡأٓمِرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ
وَٱلنَّاهُونَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡحَٰفِظُونَ لِحُدُودِ ٱللَّهِۗ
وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ١١٢ مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن
يَسۡتَغۡفِرُواْ لِلۡمُشۡرِكِينَ وَلَوۡ كَانُوٓاْ أُوْلِي قُرۡبَىٰ مِنۢ بَعۡدِ
مَا تَبَيَّنَ لَهُمۡ أَنَّهُمۡ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَحِيمِ ١١٣ وَمَا كَانَ
ٱسۡتِغۡفَارُ إِبۡرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَن مَّوۡعِدَةٖ وَعَدَهَآ إِيَّاهُ
فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥٓ أَنَّهُۥ عَدُوّٞ لِّلَّهِ تَبَرَّأَ مِنۡهُۚ إِنَّ إِبۡرَٰهِيمَ لَأَوَّٰهٌ حَلِيمٞ
١١٤ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِلَّ قَوۡمَۢا بَعۡدَ إِذۡ هَدَىٰهُمۡ حَتَّىٰ
يُبَيِّنَ لَهُم مَّا يَتَّقُونَۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٌ ١١٥ إِنَّ ٱللَّهَ
لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ يُحۡيِۦ وَيُمِيتُۚ وَمَا لَكُم مِّن
دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٖ ١١٦ لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى
ٱلنَّبِيِّ وَٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِي
سَاعَةِ ٱلۡعُسۡرَةِ مِنۢ بَعۡدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٖ
مِّنۡهُمۡ ثُمَّ تَابَ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّهُۥ بِهِمۡ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ ١١٧

٢٠٥

**بێ بەڵگە کەس تاوانبار ناکرێ:**

﴿١١٥ وما كان الله ليضل قوما بعد إذ هداهم﴾ خۆ پاش ئەوەش خوا خەڵکێکی خستبێتە سەر راستە رێ ، ئیتر نەبووە جارێکی تر گومڕایان بکات. ئەم ئایەتەش سەبارەت بە هەندێ لەو موسڵمانانە هاتە خوارێ کە داوای لێبوردنیان کردبوو بۆ موشریکەکان، لە پاشان ترسان کەخوا قاریان لێ بگرێ، ئینجا هات بۆ دڵدانەوەیان ﴿حتى يبين لهم ما يتقون﴾ تا ئەو شتانەیان بۆڕوون بکاتەوە کە دەبێ خۆیانی لێ پارێزن ﴿إن الله بكل شئ عليم﴾ بێگومانە خوا بەهەموو شتێك زاناو بەئاگایە ﴿١١٦ إن الله له ملك السموات والأرض﴾ بەڕاستیی دەسەڵاتی تەواوی ئاسمانەکان و زەویی هەر بۆ خوایە ﴿يحي ويميت﴾ کێی ویست دەیژێنی، کێیشی ویست ئەیمرێنێ و، هیدایەت وگومڕاییش هەر بەدەستی خۆیەتی ﴿وما لكم من دون الله من ولى ولا نصير﴾ بێجگە لەخواش هیچ دۆست و پشتیوانێکتان دەست ناکەوێت لە سزا ڕزگارتان کات، دەسا ئیتر هەر لەخوێ بترسن.

**خەزاکەی تەبووك:**

﴿١١٧ لقد تاب الله على النبى﴾ چوون بۆ جیهاد فەرمان و کارێکی براوەی خوایە، بۆیە هەر جۆرە دواکەوتنێك- بێ بیانووی شەرعیی- وەرناگیرێ و ناپەسەندەو تۆڵەی هەیە.. بۆیە خوا لەوکارەی پەیامبەرەیش خۆش بوو کە: مۆڵەتی دەستەیەك لەدوو ڕووەکانیدا کە: لە گەڵی نەچن بۆ جەنگی تەبووك ﴿والمهاجرين والأنصار﴾ وە لە کۆچکەران و پشتیوانانیش- کە هەندێکیان چوونە جیهادو، هەندێکیشیان خۆیان بە زەوییدا نووساند خۆشبوو ﴿الذين اتبعوه فى ساعة العسر﴾ ئەوانەیان کە لە جەنگە سەختەکەی (تەبووك)دا دوای پێغەمبەر کەوتن و پەیڕەوییان لێکردو چوونە تەبووك ﴿من بعد ما كاد يزيغ قلوب فريق منهم﴾ پاش ئەوە خەریکبوو هێندێکیان دڵیان لاڕێ بێت و نەچنە جیهادەکەوە! ﴿ثم تاب عليهم﴾ پاشان دووبارە خوا تەوبەی لێوەرگرتن ﴿إنه بهم رؤف رحيم﴾ چونکە بەڕاستیی خوا بەرامبەر بەوانە زۆر بەلوتفە، زۆریش لەگەڵیان بە میهرە.

**سەرگزوشتەی سێ هاوەڵە جێماوەکان:**

﴿١١٨ وعلى الثلاثة الذين خلفوا﴾ خوا تەوبەی لەو سێ کەسەش وەرگرت کەخۆیان لە غەزاکە گرتە دواوە، واتە: لە مەدینە مانەوەو نەچوونە جەنگی تەبووك ﴿حتى إذا ضاقت عليهم الارض بما رحبت﴾ تا لەخەفەتدا وای لێهات ئەم زەوییە فراوانەیان لاتەنگ بوو ﴿وضاقت عليهم انفسهم﴾ و لەخەم و خەفەتا لە گیانی خۆیان بێزار بوون، چونکە پەیامبەر ﷺ بڕیاریدابوو نابێ هیچ کەسێك تەنانەتی سڵاویشیان لێ بکات، هەتا فەرمانی خوا دێت!! ﴿وظنوا ان لا ملجأ من الله إلا إليه﴾ ئیتر زانییان کە هیچ پەنایەکیان نەماوە، مەگەر هەر پەنا بەخوا بەرن ﴿ثم تاب عليهم ليتوبوا﴾ لەپاشان خوا ڕێنمایی تەوبەی کردن ، بۆئەوە تەوبە بکەن، ئیتر ئەوانیش تەوبەیان کردو خوا بەخشینی ﴿إن الله هو التواب الرحيم﴾ بە ڕاستیی تەنها ئەو خوایە قەبووڵکاری تەوبەو، لێبوردە، زۆریش دلۆڤان و میهرەبانە ﴿١١٩ يا أيهاالذين آمنوا اتقوا الله﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! لە نافەرمانی خوا پارێز بکەن ﴿وكونوا مع الصادقين﴾ وهەمیشە لەگەڵ دەستەی ڕاستان بن، ئەوانە کە لەگەڵ پێغەمبەردا چوونە خەزاو، بۆ ڕێی خوا بەماڵ و بەگیان تێکۆشان ، ئەوسێ هاوەڵەش لەبەر ئەوەبوو خوا دەرگای خێری لێکردنەوە ، چونکە پاش ئەوە تووشی ئەو تاقییکردنەوەیە بوون و هەر کەپێغەمبەر لە تەبووك گەڕایەوە، هاتن ئەوەی ڕاستیبوو گوتیان و ، هیچ شتێکیان لێ نەشاردەوە، بەڵێ (عوسمانی کوڕی عەفان) بوو توانی ئەو بەهرەو بەشە گەورەیە بۆخۆی مسۆگەر بکاو، لەو ڕۆژە تەنگەدا سوپاکەی (تەبووك) بۆ پێغەمبەر ﷺ وەڕێخاو، لەو ڕۆژە ناسۆرە دەربازی بکاو، ئەویش پێی بفەرموێ: (ما

ضر ابن عفان ما عمل بعد اليوم) المسند ٧٥/٤. واتە: ئیتر پاش ئەمڕۆ عوسمانی کوڕی عەفان هەرچی بکا، زیان ناکات .

**پاداشی چوونە جیهاد:**

﴿[١٢٠] ما كان لأهل المدينة ومن حولهم من الأعراب﴾ بۆ مەدینەییەکان و عەرەبە بیابانیەکانی دەوروو بەری مەدینە حەڵاڵ نیە ﴿أن يتخلفوا عن رسول الله﴾ کە خۆ دواخەن لە پەیامبەری خواﷺ لەماڵەوە لێیدانیشن ﴿ولا يرغبوا بأنفسهم عن نفسه﴾ و گیانی خۆیان لە گیانی پەیامبەر لا گرنگتربێت و خۆیانی لێ هەڵاوێرن و، ئەم هەموو پاداشەی قیامەتە لەدەست بدەن ﴿ذلك بأنهم لا يصيبهم ظمأ ولا نصب ولا مخمصة فى سبيل الله﴾ چونکە هەر تینوویەتیی و ماندوویەتیی و برسییەتییەکیان لەڕێی خوا تووش دەبێ ﴿ولايطئون موطئا﴾ وهەر هەنگاوێك دەیهاوێن ﴿يغيظ الكفار﴾ و بێ باوەڕەکان تووڕە بکات ﴿و ينالون من عدو نيلا﴾ وهەر زیانێك لە دوژمنی خوا دەدەن ﴿إلا كتب لهم به عمل صالح﴾ بەهەر یەك لەوانە خوای گەورە کردەوەیەکی چاکیان بۆ دەنووسێ ﴿إن الله لايضيع أجر المحسنين﴾ بێگومان خوا ڕەنجی کارچاکان بەزایە نادات، ئەوانە کە بوونە باڵاگەردانی پێغەمبەری خواو، کەم تا زۆر لێی کلا نەبوون ﴿[١٢١] ولا ينفقون نفقة صغيرة ولا كبيرة﴾ و هەرچەندە ماڵ بەخت دەکەن، کەم، یان زۆر لەڕێی خوادا ﴿ولا يقطعون واديا﴾ و هەر شیوو و دۆڵێك دەبڕن بۆ جیهاد ﴿إلا كتب لهم﴾ ئیللا هەموویان بۆ دەنوسرێ ﴿ليجزيهم الله احسن ما كانوا يعملون﴾ هەتا خوا بەچاکتر لەوەی کردوویانە پاداشیان بداتەوە، واتە: هەرگیز لە ڕێبازەکەی پێغەمبەرو هاوەڵانی کلا مەبن، وەکو (کەعبی کوڕی مالیك و، هیلالی کوڕی ئومەییەو، موراەی کوڕی ڕەبیع) نەکەن، چونکە وەکو (کەعب) خۆی دەڵێ: بێجگە لە(بەدر) ئامادەی گشت خەزاکان بووە، بەڵام لەم خەزایەی تەبووکدا کەهەموو ئامێرو کەل و پەلێکی جەنگیشی هەبوو، هەر ئەمڕۆو سبەینێی کردو نەکەوتە ڕێ هەتا ئەوان گەڕانەوەو، ئەمیش تووشی ئەو گیروگرفتەیە بوون. ﴿[١٢٢] وما كان المؤمنون لينفروا كافة﴾ هەق نەبوو باوەڕدارەکان هەموو بەجارێ بچنە جیهادو شارو گوندەکان چۆڵ بکەن. بەڵێ پاش هەڕەشەکانی خوای گەورە لە وانەی خۆیان لەجیهاد دەدزیەوەو دوا دەکەوتن لەجیهاد، موسڵمانەکان پەیمانیاندا کە ئیتر لەمەو دوا هیچ کەسێکیان بەجێ نەمێنێ، هەر بۆیە کاتێ پەیامبەر ﷺ چوویە مەدینە هەموو بەجارێ پەلاماریان دەداو دەچوونە خەزاو، پەیامبەریش ﷺ بەتەنیا خۆی دەمایەوە، ئینجا ئەو ئایەتە هات.﴿فلو لا نفر من كل فرقة منهم طائفة﴾ با لەباتی ئەوە هەموو بچنە دەرێ، لەناو هەر دەستەیەك چەند کەسێکیان بچنە دەرێ ﴿ليتفقهوا فى الدين﴾ بۆ ئەوەی-لەو جم وجوولەی جیهادەدا- لە کاروباری ئاییندا شارەزاو ئاگادار بن و، باش تێبگەن کە: ئیسلام ئاییني

الجزء الحادي عشر — سورة التوبة

وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُواْ حَتَّىٰٓ إِذَا ضَاقَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلۡأَرۡضُ
بِمَا رَحُبَتۡ وَضَاقَتۡ عَلَيۡهِمۡ أَنفُسُهُمۡ وَظَنُّوٓاْ أَن لَّا مَلۡجَأَ
مِنَ ٱللَّهِ إِلَّآ إِلَيۡهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيۡهِمۡ لِيَتُوبُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ
ٱلرَّحِيمُ ﴿١١٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَكُونُواْ مَعَ
ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١١٩﴾ مَا كَانَ لِأَهۡلِ ٱلۡمَدِينَةِ وَمَنۡ حَوۡلَهُم
مِّنَ ٱلۡأَعۡرَابِ أَن يَتَخَلَّفُواْ عَن رَّسُولِ ٱللَّهِ وَلَا يَرۡغَبُواْ بِأَنفُسِهِمۡ
عَن نَّفۡسِهِۦۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ لَا يُصِيبُهُمۡ ظَمَأٞ وَلَا نَصَبٞ
وَلَا مَخۡمَصَةٞ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَطَـُٔونَ مَوۡطِئٗا يَغِيظُ
ٱلۡكُفَّارَ وَلَا يَنَالُونَ مِنۡ عَدُوّٖ نَّيۡلًا إِلَّا كُتِبَ لَهُم
بِهِۦ عَمَلٞ صَٰلِحٌۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٢٠﴾
وَلَا يُنفِقُونَ نَفَقَةٗ صَغِيرَةٗ وَلَا كَبِيرَةٗ وَلَا يَقۡطَعُونَ
وَادِيًا إِلَّا كُتِبَ لَهُمۡ لِيَجۡزِيَهُمُ ٱللَّهُ أَحۡسَنَ مَا كَانُواْ
يَعۡمَلُونَ ﴿١٢١﴾ ۞ وَمَا كَانَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ لِيَنفِرُواْ كَآفَّةٗۚ
فَلَوۡلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرۡقَةٖ مِّنۡهُمۡ طَآئِفَةٞ لِّيَتَفَقَّهُواْ فِي ٱلدِّينِ
وَلِيُنذِرُواْ قَوۡمَهُمۡ إِذَا رَجَعُوٓاْ إِلَيۡهِمۡ لَعَلَّهُمۡ يَحۡذَرُونَ ﴿١٢٢﴾

نصف الحزب ٢١

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ٢٠٦

جمووجوولە ﴿ولینذروا قومهم إذا رجعوا إلیهم﴾ و کە لەگۆڕەپانی جیهادیش گەڕانەوە ناو خێڵی خۆیان ، بیان ترسێنن و هۆشیاریان بکەنەوە ﴿لعلهم یحذرون﴾ بەڵکو لە نافەرمانی خوا خۆ وەدوور بگرن.

**لەگەڵ کافرە هاوسێکانتان بەشەڕ بێن:**

﴿[١٢٣] یاایها الذین آمنوا﴾ ئەی گەلی خاوەن باوەڕ! ﴿قاتلوا الذین یلونکم من الکفار﴾ لەگەڵ ئەو کافرانەدا بجەنگێن لێتانەوە نزیکن، واتە: بەر لە هەمووشتێ دەبێ دەورو بەری خۆتان پاك بکەنەوە لەشیرك و خوانەناسی، ئەو جا بڕۆن بۆ جێگەکانی تر، بۆیە پێغەمبەریش ﷺ لەبەرا لە عەرەبەکانی دەورو بەریەوە دەستی پێدە کرد ﴿ولیجدوا فیکم غلظة﴾ و دەبێ توندو تیژیی و زەبرو زەنگیشتان لێ ببینن، واتە: باهەست بکەن بە توندو تیژیی و لێبڕانتان ﴿واعلموا ان الله مع المتقین﴾ و چاکیش بزانن کە: خوا لەگەڵ خۆ پارێزانە.

**ئیمان زیادو کەم دەکات:**

﴿[١٢٤] وإذا ما انزلت سورة﴾ وە هەر کە بەشێك لە قورئان دێتە خوارێ ﴿فمنهم من یقول ایکم زادته هذه إیمانا﴾ هەندێ لە دووڕووان بەگاڵتەوە بەوی تر دەڵێ: ئاخۆ ئەم سوورەتە باوەڕی کێتان زیاد بکات ؟ ﴿فأما الذین آمنوا﴾ جا ئەوانەی باوەڕیان هێناوە ﴿فزادتهم إیمانا﴾ ئیمان و بیروباوەڕیان زیاد دەکات ﴿وهم یستبشرون﴾ و بەهاتنەکەشی دڵشادو خۆشحاڵدەبن ﴿[١٢٥] واما الذین فی قلوبهم مرض﴾ وە ئەوانەش لە دڵیاندا نەخۆشیی و نیفاق هەیە ﴿فزادتهم رجسا إلی رجسهم﴾ کوفرو ناپاکییان پتر دەکات ، واتە: لەباتی بەرەوهەق هاتنیان، بەدگومانیان خەستتر دەبێتەوە ﴿وماتوا وهم کافرون﴾ و کەمردیشن هەر بەکافری مردن و، حاشایان لەدینی ئیسلام کرد.

**تاقیکردنەوەی دوو ڕووەکان:**

﴿[١٢٦] اولا یرون انهم یفتنون فی کل عام مرة او مرتین﴾

ئاخۆ نابینن کە هەر ساڵەی جارێ، یان دوو جار تاقییدەکرێنەوە" بەبێ بارانیی و، بە جیهادو ڕۆیشتن بۆ جەنگ" ﴿ثم لا یتوبون﴾ کە چی هەر تەوبە ناکەن ﴿وهم لا یذکرون﴾ و بیرناکەنەوەو پەند وەرناگرن ﴿[١٢٧] وإذا ما انزلت سورة﴾ هەر کە بەشێ لە قورئان دەنێردرێت و نهێنییەکانی ئەوانی تێدابێ و، لای پێغەمبەر بن ﷺ ﴿نظر بعضهم إلی بعض﴾ بۆ یەکتری ئەڕوانن و لەخەجاڵەتی خۆیاندا دەڵێن : ﴿هل یراکم من احد﴾ ئاخۆ بڵێی کەسێك لە موسڵمانەکان بتانبینێ، ئەگەر بۆی دەرچن و بەجێ بهێڵن ﴿ثم انصرفوا﴾ لە پاشان خۆیان دەکێشایە دواوەو دەگەڕانەوەو دەردەچوون ﴿صرف الله قلوبهم﴾ یاخوا دڵیان لە باوەڕ وەرچەرخێ ﴿بانهم قوم لا یفقهون﴾ چونکە بەڕاستی خەڵکێکی تێنەگەیشت و نەفامن .

الجزء الحادي عشر — سورة التوبة

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ يَلُونَكُم مِّنَ ٱلْكُفَّارِ وَلْيَجِدُواْ فِيكُمْ غِلْظَةً وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿١٢٣﴾ وَإِذَا مَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ فَمِنْهُم مَّن يَقُولُ أَيُّكُمْ زَادَتْهُ هَٰذِهِۦٓ إِيمَٰنًا فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَزَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَهُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿١٢٤﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَتْهُمْ رِجْسًا إِلَىٰ رِجْسِهِمْ وَمَاتُواْ وَهُمْ كَٰفِرُونَ ﴿١٢٥﴾ أَوَلَا يَرَوْنَ أَنَّهُمْ يُفْتَنُونَ فِى كُلِّ عَامٍ مَّرَّةً أَوْ مَرَّتَيْنِ ثُمَّ لَا يَتُوبُونَ وَلَا هُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٢٦﴾ وَإِذَا مَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ نَّظَرَ بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ هَلْ يَرَىٰكُم مِّنْ أَحَدٍ ثُمَّ ٱنصَرَفُواْ صَرَفَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُم بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ ﴿١٢٧﴾ لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢٨﴾ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُلْ حَسْبِىَ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ ﴿١٢٩﴾

سُورَةُ يُونُسَ

٢٠٧

**منەتی خوا بزانن کە پێغەمبەری بۆ ناردن:**

﴿[١٢٨] لقد جاءكم رسول من انفسكم﴾ سوێند بەخوا هەر لەخۆتان پەیامبەرێکی پایە بەرزتان بۆ هات و چاك دەیناسن لەکێیە ﴿عزیز علیه ماعنتم﴾ هەر ناڕەحەتییەکتان توش بێت زۆر سەختە لایی و پێی سەخڵەت دەبێ ﴿حریص علیکم﴾ زۆریش سوورە لەسەر بڕوا هێنانتان ﴿بالمؤمنین رؤوف رحیم﴾ بەرامبەر بە بڕواداران زۆر دڵسۆزو بە بەزەیی و دلۆڤانە، لە سوورەتی (١٦٤/٣) یشدا دەفەرموێ: (لقد من الله علی المؤمنین إذ بعث فیهم رسولا من انفسهم...) جەخت لە سەر هەمان مەبەست دەکاتەوە ﴿[١٢٩] فإن تولوا فقل حسبی الله﴾ ئینجا ئەر بەهاتنەکەت بەهرەمەند نەبوون ، دڵ زویر مەبەو بڵێ: من هەر خوام بەسە ﴿لا إله إلا هو﴾ بێ لەو خوایە هیچ پەرستراوێك نییە شیاوی پەرستن بێت ﴿علیه توکلت﴾ هەر بەویش پشتدەبەستم ﴿وهورب العرش العظیم﴾ و هەر ئەویشە خاوەن و پەروەردگاری عەرشی گەورە. بەڵێ تەنها خوا بەپشتیوان زانین پیشەی هەموو پێغەمبەران بووە: وەکو لە سوورەتی (٥٤/١١-٥٦)دا دەفەرموێ: (قال إنی اشهد الله واشهدوا انی بریء مماتشرکون من دونه فکیدون جمیعا ثم لاتنظرون إنی توکلت علی الله ربي وربکم..) وە لەسوورەتی (١٢/١٤)دا سەبارەت بە(نووح) دەفەرموێ: (فعلی الله توکلت فأجمعوا أمرکم..) وە پێغەمبەرانی تر دەڵێن: (وما لنا الا نتوکل علی الله وقد هدانا..). ئەبوو (خەیسەمە)ی ئەنصاریی (خوای لێ ڕازی بێت) ڕۆژێ چوویە ناو باخەکەیەوە، ژنێکی جوانیشی هەبوو، لەسێبەرێکی خەست و خۆڵدا ڕایەخێکی بۆ ڕاخست و، فەریکە خورماو ئاوی خۆشی بۆ هێنا، پاشان بیرێکی کردەوەو سەیرێکی کردو وتی: سێبەرێکی خەست و، فەریکە خورما یەکی چاك و، ئاوێکی ساردو، ژنێکی جوان و..!! پەیامبەریش ﷺ لەبەر خۆرو گەرمادا بێت.. ئای ئەم کارەم چ کارێکی ناڕەواو نادروستە !! ئیتر دەست بەجێ هەڵساو وشترەکەی ئامادەکردو شیرو ڕمەکەی بەدەستەوە گرت و بەپەلە ڕێگای گرتە بەرو ڕۆیشت، پەیامبەریش ﷺ لەوێ سەیری کرد، دیتی وا لەدوورەوە سوارێ بەپەلە هات ، زۆر حەزی دەکرد (ئەبوو خەیسەمە) بێت، بۆیە فەرمووی: (کن ابا خیثمة) واتە: بەش ئەم سوارە وا بەپەلە دێت (ئەبوخەیسەمە) بێ، بەڵێ کە گەیشت و هاتە پێشەوە بە (ئەبوو خەیسەمە) دەرچوو، ئیتر پێغەمبەر ﷺ زۆری حەز کرد ، پاشان لەخوا داوای لێبوردنی بۆ کرد.

کۆتایی تەفسیری سوورەتی (تەوبە) والحمد لله رب العالمین .

ئێمەش داوای لێبوردن لەگشت هەڵەو پەڵەیەکمان دەکەین.

*** *** ***

## ١٠- سوورەتی (یونس)ـە

## مەککەییەو (١٠٩) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتەش لەو سوورەتە مەککەییانەیە کەبایەخ بە بنەماو بناغە ئیسلامییەکان دەدەن وەکو:(بڕوا بەخوا، بە گشت کتێب و نامەکانی و، بەپەیامبەران و، بە زیندووبوونەوەو، بە پاداش و تۆڵە) دەشتوانی بڵێیت بەمە لە سوورەتەکانی تر جیادەکرێتەوە کە: مرۆڤەکان بانگ دەکات بۆ بڕواهێنان بە گشت کتێبە ئاسمانیەکان، بەتایبەت قورئانی پیرۆز. بۆیەکەمجار بە باسێکی پەیامبەرمان (موحەممەد) ﷺ و پەیامەکەی دەست پێدەکات، ئەو ڕاستیەش دەسەلمێنێت کە: هەر ئوممەت و نەتەوەیەك پەیامبەرێکی بۆ هاتووە، کەوابوو بەناهەق سەریان لەهاتنی موحەممەدﷺ سووڕ دەمێنێ، لەکاتێکدا هەر لەخۆشیانە، بۆیە دەفەرموێ: (اکان للناس عجبا أن أوحینا إلی رجل

منهم..).. لەپاشان چەند ئایەتێك بۆ روونكردنەوەی "ئولوهییەت" و "عبودییەت" دێنێ، ئەوساش خەڵكی بۆ بەراست خواناسین و ملكەچ بوون بۆی ڕێنوێن دەكاو، پێیان دەڵێت كە: تەنها خوا دروستكارو رۆزی دەرە، هەر ئەوە ژیان و مردنی بەدەستە، كاروباری گێتی و جیهان تەنها بەوە.. جگە لە خوا هیچ كەسێك شتێكی بەدەست نیەو، غەیرەز خۆیشی هەموو تیادەچێ ودەفەوتێ. ئینجا هەڵوێستی هاوەڵدانەران بەرامبەر بە قورئان و پەیامەكەی پەیامبەر ﷺ باس دەكاو دەڵێت: ئەم قورئانە بەڵگەو موجیزەیەكی نەمرەو، هەتا دونیا دونیابێت هەر ئەمێنێتەوە. وەهەم پێیان دەڵێت: فەرموون ئەگەر راست دەكەن لە دەعواكەتاندا تەنها سورەتێ لەوێنەی ئەم قورئانە بهێنن، كە ئێوە خۆتان بەسەرچاوەی خۆشخوانیی و رەوانبێژیی دەزانن! دەستی ئادەمیی دەگرێ و، گەلێ سیفاتی خوایان پێدەناسێنێ و، پاشان بەبوونەوەردا ئەیانگێڕێ و پێیان دەڵێت: وەرن لەم ئاسمان و زەویەدا سەیری شوێنەواری دەسەڵاتی خوابكەن و بزانن چ عەجایباتێ دەبینن، پاشان داستانی هەندێ لەپەیامبەران، (نوح) و گەلەكەی (موسا)و نەتەوەكەی، وەهەروەها فیرعەونی تاغووت.. هەروەك دەست دەخاتە بان چیرۆكی (یونس) پەیامبەر ﷺ هەر بۆیە سوورەتەكەش بەسوورەتی (یونس) ناوبراوە . فەرمان بە پەیامبەر ﷺ دەدا كە: تەنها دەست بە شەریعەتەكەی خواوە بگرێ و ، دەبێ بەرامبەر بەوهەموو ئازارو ئەشكەنجە دەكرێن لە لایەن تاوانبارانەو خۆراگرو بە ئارامبێ.. تا كۆتا بڕیاری خوای بۆ دێ.

سُورَةُ يُونُسَ — الجُزْءُ الحَادِي عَشَرَ

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

الٓرۚ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْحَكِيمِ ﴿١﴾ أَكَانَ لِلنَّاسِ عَجَبًا
أَنْ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰ رَجُلٍ مِّنْهُمْ أَنْ أَنذِرِ ٱلنَّاسَ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟
أَنَّ لَهُمْ قَدَمَ صِدْقٍ عِندَ رَبِّهِمْۗ قَالَ ٱلْكَٰفِرُونَ إِنَّ هَٰذَا
لَسَٰحِرٌ مُّبِينٌ ﴿٢﴾ إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ
فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِۖ يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَۖ مَا مِن شَفِيعٍ
إِلَّا مِنۢ بَعْدِ إِذْنِهِۦۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ فَٱعْبُدُوهُۚ أَفَلَا
تَذَكَّرُونَ ﴿٣﴾ إِلَيْهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًاۖ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقًّاۚ إِنَّهُۥ
يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ لِيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ
بِٱلْقِسْطِۚ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَهُمْ شَرَابٌ مِّنْ حَمِيمٍ وَعَذَابٌ
أَلِيمٌۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ ﴿٤﴾ هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ ٱلشَّمْسَ
ضِيَآءً وَٱلْقَمَرَ نُورًا وَقَدَّرَهُۥ مَنَازِلَ لِتَعْلَمُوا۟ عَدَدَ ٱلسِّنِينَ
وَٱلْحِسَابَۚ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ ذَٰلِكَ إِلَّا بِٱلْحَقِّۚ يُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ
لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٥﴾ إِنَّ فِى ٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَمَا خَلَقَ
ٱللَّهُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَّقُونَ ﴿٦﴾

إِنَّ ٱلَّذِينَ — ٢٠٨

**پێغەمبەر هەر لە ئادەمزاد رەوانە دەكرێ:**

﴿بسم الله الرحمن الرحیم* [١] الـر تلك آيات الكتاب الحكيم﴾ ئەمە چەند ئایەتێكی ئەو قورئانە مەحكەم و بە پێزەیە ﴿[٢] اكان للناس عجبا ان اوحينا إلى رجل منهم﴾ ئاخۆ بۆ خەڵك جێی سەرسوڕمانە كەوەحیمان بۆ پیاوێكیان كردووەو كردوومانەتە پێغەمبەرو پێمان گوتووە ؟! ﴿ان انذر الناس﴾ كە گشت مەردم بەسزای دواڕۆژی خوای گەورەو بەدەسەلات بترسێنە ﴿وبشر الذين آمنوا﴾ و بەو كەسانەش باوەڕیان هێناوە مژدەو مزگێنی بدە ﴿انّ لهم قدم صدق عند ربهم﴾ كە بەڕاستیی پایەو پلەو پاداشی باش و بەرزیان بۆ هەیە لای پەروەردگاریان، بە هۆی ئەوەی لە دنیادا كارو كردەوەی چاكیان پێشخستووە ﴿قال الكافرون إن هذا لساحر مبين﴾ كەچی كافرو بێ باوەڕەكان بەپێغەمبەرێكی ئاوایان گوت: بێگومان ئەم موحەممەدە ﷺ جادوو گەرێكی ئاشكراو ڕوونە!

**خوا بەدیهێنەری گشت بوونەوەرە:**

﴿[٣] إن ربكم الله الذی خلق السموات والأرض فی ستة أیام﴾ بەڕاستیی پەروەردگارتان هەرئەو خوایەیە كە: ئاسمانەكان و زەویی لە ماوەی شەش رۆژدا دروستكرد، هەندێ دەڵێن: مەبەست بەو رۆژانە، هەر ئەم رۆژانەی

دنیایـه، هەنـدێکیش دەڵێن: هـەر ڕۆژەی بەقـەد هـەزار ڕۆژەی ئێسـتامانە ﴿ثم استوى على العرش﴾ پاشـان بـەو شێوەیە کە شایستەو شیاوی زاتی ئەوبێ و، ئەو خۆی مەبەستیبێ، چوویە سەر عەرشی فەرمانڕەوایی خۆی، هەر بۆیە زاناکانیش لە تەفسیریدا دەڵێن: (أی استواء یلیق بجلاله من غیر تشبیه ولا تمثیل ولا تعطیل ولا تحریف کما هو مذهب السلف . وکما قال الإمام مالك-رحمه الله- :الإستواء معلوم، والکیف مجهول، والإیمان به واجب، والسؤال عنه بدعة. وقال الإمام أحمد- رحمه الله:- أخبار الصفات تمر کما جاءت ، بلا تشبیه ولا تعطیل، فلا یقال: کیف؟ ولِمَ ؟ نؤمن بأن الله على العرش کیف شاء وکماشاء بلا حد ولا صفة یبلغها واصف، أو یحدها حاد، نقرأ الآیة والخبر ونؤمن بما فیهما ونکل الکیفیة فی الصفات إلى علم الله عزوجل). ﴿یدبر الأمر﴾ بەتەنها بۆ خۆی کارو باری جیهان بەڕێوە دەبا، بێ ئەوەی هیچ کەسێك بتوانێ ڕێی لێبگرێ و هەڵیوەشێنێتەوە ﴿مامن شفیع إلا من بعد إذنه﴾ خۆی بەدواوە هیچ تکاکارێك نییە تکایان بۆ بکا، مەگەر کەسێك ئەو بۆخۆی مۆڵەتی بدا ﴿ذلکم الله ربکم فاعبدوه﴾ هەر ئـەو خوایـە(اللـه)یە پـەروەردگارتان ، دەسا ئێـوەش هـەر ئـەو بپەرسـتن ﴿أفلا تـذکرون﴾ ئـاخۆ پەنـدو ئامۆژگـاری وەرناگرن و، وردنابنەوە لەو هەموو بوونەوەرە پڕلە عەجایباتە ؟.

**هەموان هەر بۆ لای خوا دەچنەوە:**

﴿٤ إلیه مرجعکم جمیعا﴾ هەموو هەر بۆلای ئەو دەگەڕێنەوەو، پاداش و تۆڵە وەردەگرن ﴿وعد الله حقا﴾ خوا بەڵێنێکی ڕاست و دروستی داوەو، بۆ خۆی دەیباتە سەرو، هەرگیز پێچەوانەکەی ڕوونادات ﴿إنه یبدأ الخلق ثم یعیده﴾ چونکە بەڕاستیی هەرئەو بۆخۆی لە سەرەتاوە"بێبنج وبناغە" گشت دروستکراوەکان بەدیدێنێ ، لەپاشان هەر بەتەنیا خۆیشی وەك خۆی لێدەکاتەوە، واتە: زۆر بە ئاسانتر -پاش مردن- زیندوویان دەکاتـەوە ﴿لیجزی الله الـذین آمنـوا وعملـوا الصـالحات بالقسـط﴾ هـەتا ئەوانـەی بڕوایـان هێنـاوەو ئاکاریـان چـاکبووە، خـوای گـەورە بەدادگەرانە پاداشیان بداتەوە ﴿والذین کفروا﴾ و ئەوانەش وا کافرو بێ باوەڕ بوون ﴿لهم شراب من حمیم وعذاب الیم﴾ خواردنەوەیەکی زۆر گەرم و، سزایەکی ئێش پێگەیەنەریان بۆ هەیە ﴿بما کانوا یکفرون﴾ لەبەر کافریی و بێ باوەڕییان. لە چەند ئایەتێکی دیکەدا نموونەی ئەوسزاو جەزرەبەیە بەخەستتر دەخاتـەڕوو، بۆنموونە: لەسوورەتی (٤٤/٥٥)دا دەفەرموێ: (یطوفون بینها وبین حمیم آن..) یان لەسوورەتی (٤٧/١٥)دا دەفـەرموێ: (وسقوا مـاء حمیما فقطع أمعاءهم..) یان لەسوورەتی(٢٢/١٩-٢٠)دا دەفەرموێ: (یصب من فوق رؤسهم الحمیم، یصهر به ما فی بطونهم والجلود) یان لەسوورەتی (١٨/٢٥)دا دەفەموێ: (وإن یستغیثوا یغاثوا بماء کالمهل یشوی الوجوه) یان لەسوورەتی (٥٦/٥٤-٥٥)دا دەفـەرموێ: (فشـاربون علیـه مـن الحمـیم، فشـاربون شـرب الهـیم) یـان لەسـوورەتی (١٤/١٦)دا دەفەرموێ: (من ورائه جهنم ویسقى من ماء صدید یتجرعه ولا یکاد یسیغه..).

**هەمووشتێ شایەتی بوون و تاك و تەنیایی خوایە:**

﴿٥ هوالذی جعل الشمس ضیاء﴾ خوا هەر ئەو زاتەیە کە: تیشك و ڕووناکیی بەخۆر بەخشیوە ﴿والقمر نورا﴾ و مانگیشـی ڕووناککردۆتـەوە، لـە خـۆرەوە ڕوونـاکیی دەداتـێ و، ڕووی زەویـی بـۆ ڕوونـاك کردوونەتـەوە ﴿وقـدره منازل﴾ و چـەند جێ و مەنزڵگەیەکیشـی بـۆ دیاریی کـرووە، واتـە: بـە (٢٨) قونـاغ ومەنزڵدا تێدەپـەڕێ ، وەکـو لـە سـوورەتی (یـس)یشـدا دەفـەرموێ (والقمـر قدرناه منـازل حتـى عـاد کـالعرجون القدیم/٣٩. ﴿لتعلمواعدد السنین والحساب﴾هە تا ئێوە ژمارەی ساڵەکان وحسابی مانگ و ڕۆژەکان بزانن ﴿وما خلق الله ذلك إلا بالحق﴾ بێگومـانیش خوای کاردرووست ئەو خۆرو مانگەی بێهوودە دروست نـەکردووە، بـەڵکو بەهـەق و دروست بـەدیهێناوە ﴿یفصل

﴿الآيات لقوم يعلمون﴾ خوا بەڵگەکانی خۆی بۆ گەلێك بە دەسەڵاتی ئەو بزانێت شیی دەکاتەوە ﴿[٦] إن فی اختلاف الليل والنهار﴾ بێگومان لە هاتو چۆی شەوو رۆژ و، ئاڵ وگۆڕیاندا ﴿وما خلق الله فی السموات والأرض﴾ و لەو گشت شتانەدا خوا لە ئاسمانەکان و زەوییدا دروستی کردوون ﴿لآيات لقوم يتقون﴾ گەلێ نیشانە هەیە بۆ ئەوانە لە سزای خوا خۆ دەپارێزن کەیارمەتییان بدات بۆ بە هێزبوونی ئیمان و باوەڕیان.

### جێی بێ باوەڕان هەر دۆزەخە :

﴿[٧] إن الذين لا يرجون لقاءنا﴾ بێگومان ئەوانەی وا لەرۆژی قیامەتدا ئومێدو بڕوایان بەدیدارو لیقای ئێمە نییە ﴿و رضوا بالحياة الدنيا﴾ وبۆخۆشیان بەم ژیانی گێتیە- لە باتی دوا ڕۆژ- ڕازیین ﴿واطمأنوا بها﴾ و پێی دڵنییان، واتە: وا پاڵیان پێوەداوە، وا دەزانن هەتا هەتایە تێیدا دەمێننەوە! ﴿والذين هم عن آياتنا غافلون﴾ و ئەوانەش کە لەنیشانەو ئایەتەکانی ئێمە بێ ئاگان ﴿[٨] اولئك مأواهم النار﴾ جێ وشوێنی ئەوانە گشت هەر ئاگری دۆزەخە ﴿بما كانوا يكسبون﴾ بە هۆی ئەو کارە خراپانەوە لەدنیادا کردویانن.

### پاداشی چاك و نەبڕاوە بۆ موسڵمانی ئاکار چاکە :

﴿[٩] إن الذين آمنوا وعملوا الصالحات﴾ بەڕاستیی ئەوانەش بڕوای راستەقینەیان هێناوەو ئاکاری چاکیان ئەنجام دا ﴿يهديهم ربهم بإيمانهم﴾ بەهۆی باوەڕە راستەکەیانەوە خوای پەروەردگاریان ڕێنوێنیان ئەکات بۆ ئەنجامدانی هەموو کارێکی خێرو چاك ﴿تجری من تحتهم الأنهار فی جنات النعيم﴾ و دەشیانباتە چەند بەهەشتێکەوە کە لەبنکی دارو درەخت و لە ژێر کۆشکەکانیانەوە گەلێ رووبارو چۆم دێن و دەچن ﴿[١٠] دعواهم فيها سبحانك اللهم﴾ داواو نزایان لەوێ ئەمەیە ئەڵێن: خوایە! تۆ پاك و خاوێن و بێ خەوشییت، شەریك و هاوەڵت نەبووەو نییە ﴿وتحيتهم فيها سلام﴾ و چاك و چۆنیان تێیدا درودو سڵاوە, واتە: بە یەکتری دەڵێن: سەلاو، لە سزای دۆزەخ پارێزراوبیت . سڵاوکردنی خوا لە بەهەشتیەکانە لەیەکترو، فریشتەکانیش لەوان، لەچەند جێیەکی دیکەی قورئاندا هاتووە، بۆنموونە: لە سوورەتی (٣٣/٤٤)دا دەفەرموێ: (تحيتهم يوم يلقونه سلام وأعد لهم أجرا كريما) یان لەسوورەتی(١٣/٢٣ –٢٤) دا دەفەرموێ: (والملائكة يدخلون عليهم من كل باب سلام عليكم..) یان لە سوورەتی (١٩ /٦٢)دا دەفەرموێ:(لايسمعون فيها لغوا إلا سلاما..) یان لەسوورەتی (٥٦ /٢٥ –٢٦)دا دەفەرموێ :(لايسمعون فيها لغوا ولا تأثيما إلا قيلا سلاما سلاما) یان لەسوورەتی(٣٦ /٥٨)دا دەفەرموێ: (سلام قولا من رب رحيم). ﴿وآخر دعواهم أن الحمدلله رب العالمين﴾ کۆتا دۆعایان ئەوەیە کە هەمیشە دەڵێن: تەواوی سوپاس بۆ خوای پەروەردگاری گشت جیهانەکانە، پێغەمبەری پێشەوامان دەفەرموێ (إن أهل الجنة يلهمون التسبيح والتحميد كما يلهمون



إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يَرۡجُونَ لِقَآءَنَا وَرَضُواْ بِٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَٱطۡمَأَنُّواْ
بِهَا وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَنۡ ءَايَٰتِنَا غَٰفِلُونَ ﴿٧﴾ أُوْلَٰٓئِكَ مَأۡوَىٰهُمُ
ٱلنَّارُ بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴿٨﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ
وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ يَهۡدِيهِمۡ رَبُّهُم بِإِيمَٰنِهِمۡۖ تَجۡرِي مِن
تَحۡتِهِمُ ٱلۡأَنۡهَٰرُ فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٩﴾ دَعۡوَىٰهُمۡ فِيهَا سُبۡحَٰنَكَ
ٱللَّهُمَّ وَتَحِيَّتُهُمۡ فِيهَا سَلَٰمٞۚ وَءَاخِرُ دَعۡوَىٰهُمۡ أَنِ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ
رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٠﴾ ۞ وَلَوۡ يُعَجِّلُ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ ٱلشَّرَّ (الحزب ٢١)
ٱسۡتِعۡجَالَهُم بِٱلۡخَيۡرِ لَقُضِيَ إِلَيۡهِمۡ أَجَلُهُمۡۖ فَنَذَرُ ٱلَّذِينَ
لَا يَرۡجُونَ لِقَآءَنَا فِي طُغۡيَٰنِهِمۡ يَعۡمَهُونَ ﴿١١﴾ وَإِذَا مَسَّ
ٱلۡإِنسَٰنَ ٱلضُّرُّ دَعَانَا لِجَنۢبِهِۦٓ أَوۡ قَاعِدًا أَوۡ قَآئِمٗا فَلَمَّا كَشَفۡنَا
عَنۡهُ ضُرَّهُۥ مَرَّ كَأَن لَّمۡ يَدۡعُنَآ إِلَىٰ ضُرّٖ مَّسَّهُۥۚ كَذَٰلِكَ زُيِّنَ
لِلۡمُسۡرِفِينَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١٢﴾ وَلَقَدۡ أَهۡلَكۡنَا ٱلۡقُرُونَ
مِن قَبۡلِكُمۡ لَمَّا ظَلَمُواْ وَجَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَمَا كَانُواْ
لِيُؤۡمِنُواْۚ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴿١٣﴾ ثُمَّ جَعَلۡنَٰكُمۡ
خَلَٰٓئِفَ فِي ٱلۡأَرۡضِ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ لِنَنظُرَ كَيۡفَ تَعۡمَلُونَ ﴿١٤﴾

النفس)) موسلیم/ واتە: خەڵکی بەهەشت هەر وەکو فێردەکرێن هەناسە بدەن، ئاواش فێردەکرێن تەسبیحات و سوپاسی خوا بکەن. ﴿١١ ولو یعجل الله للناس الشراستعجالهم بالخیر لقضی إلیهم أجلهم﴾ ئەگەر وەکو خەڵك بۆ بەدەست هێنانی خێرو چاکە بۆخۆی پەلەیەتی، خوایش بەهەمان شێوە بۆ تۆڵەیان بەپەلە بوایە، ئەوکات بە زوویی ئاکامیان دەهات و هەموو تیادەچوون و بەتۆڵەی خۆیان دەگەیشتن. (موجاهید) دەڵێ: مەبەست ئەوەیە کە مرۆڤ کاتێ رقی هەڵدەستێ زۆر زوو نزای شەڕو خراپە لە خۆی، یا لەماڵ و منداڵی خۆی دەکاو دەڵێ: خوایە! بەزوویی ئەمانە لەناو ببە، خوایە! بەرەکەتیان نەهێڵی. (تەبەریی)یش دەڵێ: جا ئەگەر خوایش بە پەلە وەڵامیان بداتەوە، وەك چۆن وەڵامی نزای خێریان دەداتەوەو، دۆعایان وەردەگرێت، ئەوا زۆر بەزوویی تیا دەچوون و نەدەمان ﴿فنذر الذین لا یرجون لقاءنا﴾ جا ئەوانەی بەتەمای لیقاو دیدارمان نین , وازیان لێدەهێنین ، واتە: پەلەی جەزرەبەو سزایان ناکەین ، تا بەشکو کەسێکیان لێپەیدا ببێ تەوبە بکا، وەیان لەناو نەوەکانیاندا کەسێك هەڵکەوێت باوەڕبهێنێت ﴿فی طغیانهم یعمهون﴾ با هەر لەنێو سەرکەشیی خۆیاندا سەر گەردان بن و بمێننەوە.

**گشت مرۆڤێ لەکاتی بەگیر هاتندا خوا بەیاد دەکا:**

﴿١٢ وإذا مس الإنسان الضر دعانا﴾ کە مرۆڤ زیانێکی قورسی دووچار دەبێ ، خێرا هاوارمان بۆدێنێ و لێمان دەپاڕێتەوە !! ﴿لجنبه أو قاعدا أو قائما﴾ لە سەرتەنیشت، یان بە ڕاکشان، یان بەپێوە، واتە: بە هەموو شێوەیەك دەپاڕێتەوە بۆ لادانی گرفتەکەی ﴿فلما کشفنا عنه ضره﴾ ئینجا هەر کە ناڕەحەتییەکەمان لابرد ﴿مر کأن لم یدعنا إلی ضر مسه﴾ وا بەردەوام دەبێ لە سەر تاوانکاری ، دەڵێت ڕۆژێ نەبووە داوامان لێبکات بۆ لابردنی زیانێك دووچاری ببوو !! چونکە سروشتی ئادەمیی وایە هەر کە بەڵاو نەهامەتییەك ڕووی تێ بکا، بە خەستی هاوار بۆ خوا دێنێ! جا کە کەوتە فەرحانییەوە خێرا خۆی لێدەگۆڕێت، هەروەك لە چەند جێ یەکی تردا نموونەی ئەو سروشتانە لەبارەی ئادەمیزادەوە لە قورئاندا باسکراوە، بۆنموونە: لە سوورەتی (٨/٣٩) دا دەفەرموێ: (وإذامس الإنسان ضر دعار ربه منیبا إلیه ثم إذا خوله نعمة منه نسی ماکان یدعو إلیه من قبل..) یان سوورەتی (٤٩/٣٩) دەفەرموێ: (فإذا مس الإنسان ضر دعانا...) هەروا لە سوورەتی(٥١/٤١)دا دەفەرموێ: (وإذا أنعمنا علی الإنسان أعرض ونأی بجانبه وإذا مسه الشر فذو دعاء عریض). بەڵام بەندە باوەڕدارو سەر راسەکان ددان بەخۆیاندا دەگرن و، کاری هەڵەشەیی ناکەن، وەکو دەفەرموێ: (ولئن أذقناه نعماء بعد ضراء... إلا الذین صبروا وعملوا الصالحات أولئك لهم مغفرة وأجر کبیر). ﴿کذلك زین للمسرفین ما کانوا یعملون﴾ هەر ئابەو جۆرەیش کاروکردەوەی سنوور دەرچووەکان لایان دەڕازێنرێتەوە بۆیە هەردەم شوێنی هەواو ئارەزووی خۆیان دەکەون.

**خەڵکێکی زۆر بەرلەئێوەلە بەینچوو:**

﴿١٣ ولقد أهلکنا القرون من قبلکم لما ظلموا﴾ بە ڕاستیی چینێکی زۆرمان بەرلە ئێوە -کاتێ ستەمیانکردو بێ باوەڕ بوون - لەناوبرد ﴿وجاءتهم رسلهم بالبینات﴾ خۆ پەیامبەرەکانیشیان بە چەند نیشانەو بەڵگەی ڕوونەوە بۆهاتبوو, بۆ ئەوەی باوەڕ بێنن ﴿وماکانوا لیؤمنوا﴾ وەهەر باوەڕیان نەهێنا، واتە: بۆ خۆشمان دەمانزانی کە هەر خۆبەدەستەوە نادەن و، پێ لەسەر شیرك وکوفری خۆیان دادەگرن، ئەگەر پێغەمبەرانیش بێنە لایان، بۆیە فەوتانمانن ﴿کذلك نجزی القوم المجرمین﴾ ئێمە هەر ئاوا سزای تاوانباران دەدەین ، پاش بەڵگەو تێگەیاندنیان ﴿ثم جعلناکم خلائف فی الأرض من بعدهم﴾ لەجێیاندا - پاش ئەوان- ئێوەیشمان لە زەوییداجێنشینکرد ﴿لننظر کیف تعملون﴾ تا ببینین ئێوەش چۆن ڕەفتار ئەکەن؟

## سەردارانی قورەیش ئێجگار یاخیبوون :

﴿١٥ وإذا تتلى عليهم آياتنا بينات﴾ و هەر کەئایەتە روونەکانمان بۆیان بخوێنرێتەوە ﴿قال الذين لايرجون
لقاءنا﴾ ئەوانەی کە ئومێدیان بەلیقاو دیداری ئێمە نییە دەڵێن: ﴿إئت بقرآن غير هذا أو بدله﴾ جگە لەم قورئانە،
نامەیەکی ترمان بۆ بێنە ، یان هەربیگۆڕە بەشتێکی تر، واتە: دەبێ گەلێ شتی دەسکاری بکەیت بۆمان ، حەرامانی
بۆ حەلاڵ کەیت ، وە یان بە پێچەوانەوە ﴿قل ما يكون لى ان ابدله من تلقاء نفسى﴾ پێیان بڵێ: هەر گیز من
لەخۆمەوە بۆم نیە بیگۆڕم ، چونکە ئەمە بەرنامەو شەریعەتی خوایە ، کاری من نیە دەسکاریکردنی، واتە :
تەنانەتی پێغەمبەر ﷺ بۆی نیە دەسکاری قورئان بکا، بەڵام بەیناو بەین خوا بەویستی خۆی"لەبەر ئەوحیکمەتەی
خۆی دەیزانی" ئەوکارە دەکا، بۆ نمونە: لە سوورەتی
(١٠١/١٦)دا دەفەرموێ: (وإذا بدلنا آية مكان آية والله يعلم
بما ينزل...) یان لە سوورەتی.(١٠٦/٢)دا دەفەرموێ:
(ماننسخ من آية أو ننسها نأت بخير منها أو مثلها..) یان لە
سوورەتی (٧-٦/٧٨) دا دەفەرموێ: (سنقرئك فلا تنسى إلا
ماشاء الله إنه يعلم الجهر وما يخفى...) ﴿إن اتبع إلا مايوحى
إلى﴾ من دوای هیچ شتێك ناکەوم مەگەر ئەوەی بەسروش و
وەحیی بۆم بێت، واتە: هەر شتێکم بۆ خوێندنەوە، هەر
ئەوەیەو زیادو کەم ناکرێت ﴿إنى أخاف إن عصيت ربى
عذاب يوم عظيم﴾ ئەرسەرپێچی لە پەروەردگارم بکەم ، بە
ڕاستیی لە سزای ڕۆژێکی گەورە (ڕۆژی قیامەت) دەترسم
﴿١٦ قل لو شاء الله ماتلوته عليكم﴾ بڵێ: ئەگەر خوا
ویستبای نەم دەتوانی ئەم قورئانەشتان بۆ بخوێنمەوە ﴿ولا
ادراكم به﴾ خوایش فێری نەدەکردن ﴿فقد لبثت فيكم عمرا
من قبله﴾ بێگومان من تەمەنێکی زۆرم لەناوتاندا بردەسەر –
بەرلەهاتنی ئەم قورئانە– چاکیش دەمناسن ئەر جاری
درۆیەکم هەڵبەستبێت ، یان توانیبێتم بەشێ لە قورئانتان بۆ
بێنم، ئەو دەمەش کە خوا ویستی نەبوو، نەمتوانی هیچ لەقورئان بڵێم و بیزانم ، بەڵام چونکە ئەمڕۆ ئیرادەو مەیلی
لەسەرە، لەپاش چل ساڵ بۆیناردم و هاتمە لای ئێوە ﴿أفلا تعقلون﴾ دەسا بۆ ژیری بەکار ناخەن وژیر نابن ؟چونکە
ئەگەر من خۆم دامهێنابا، هەر لەسەر دەمی لاوییدا دامدەهێنا ﴿١٧ فمن أظلم ممن افترى على الله كذبا﴾ دەبێ کێ
لەوکەسە ستەمکارتربێت کە: لە سەرخوا درۆ هەڵبەستێ وبتوانێ شتێ بکاتە قورئان وقورئانیش نەبێت؟! ﴿او كذب
بآياته﴾ یان ئایەتەکانی ئەو بەدرۆ بزانێ؟ ﴿إنه لا يفلح المجرمون﴾ بە ڕاستیی تاوانباران قەت سەرفرازو ڕزگار نابن
لەدنیاو لەقیامەتدا.

الجزء الحادي عشر — سُورَةُ يُونُسَ

وَإِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ ءَايَاتُنَا بَيِّنَٰتٖ قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرۡجُونَ
لِقَآءَنَا ٱئۡتِ بِقُرۡءَانٍ غَيۡرِ هَٰذَآ أَوۡ بَدِّلۡهُۚ قُلۡ مَا يَكُونُ لِيٓ
أَنۡ أُبَدِّلَهُۥ مِن تِلۡقَآيِٕ نَفۡسِيٓۖ إِنۡ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّۖ إِنِّيٓ
أَخَافُ إِنۡ عَصَيۡتُ رَبِّي عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ ﴿١٥﴾ قُل لَّوۡ شَآءَ
ٱللَّهُ مَا تَلَوۡتُهُۥ عَلَيۡكُمۡ وَلَآ أَدۡرَىٰكُم بِهِۦۖ فَقَدۡ لَبِثۡتُ
فِيكُمۡ عُمُرٗا مِّن قَبۡلِهِۦٓۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴿١٦﴾ فَمَنۡ أَظۡلَمُ
مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوۡ كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِهِۦٓۚ إِنَّهُۥ
لَا يُفۡلِحُ ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴿١٧﴾ وَيَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ
مَا لَا يَضُرُّهُمۡ وَلَا يَنفَعُهُمۡ وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا
عِندَ ٱللَّهِۚ قُلۡ أَتُنَبِّـُٔونَ ٱللَّهَ بِمَا لَا يَعۡلَمُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا
فِي ٱلۡأَرۡضِۚ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴿١٨﴾ وَمَا كَانَ
ٱلنَّاسُ إِلَّآ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ فَٱخۡتَلَفُواْۚ وَلَوۡلَا كَلِمَةٞ
سَبَقَتۡ مِن رَّبِّكَ لَقُضِيَ بَيۡنَهُمۡ فِيمَا فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ
﴿١٩﴾ وَيَقُولُونَ لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ ءَايَةٞ مِّن رَّبِّهِۦۖ فَقُلۡ إِنَّمَا
ٱلۡغَيۡبُ لِلَّهِ فَٱنتَظِرُوٓاْ إِنِّي مَعَكُم مِّنَ ٱلۡمُنتَظِرِينَ ﴿٢٠﴾

وَإِذَآ أَذَقۡنَا — ٢١٠

**موشریكان بەتەمای بتەكانن شەفاعەتیان بكەن:**

﴿[18] ویعبدون من دون الله ما لا یضرهم ولا ینفعهم﴾ وەلە باتی خوایش چەند شتێكی وا دەپەرستن كە: نە دەتوانن زیانێكیان پێ بگەیەنن و، نە سوودێكیان پێ ببەخشن ﴿ویقولون هؤلاء شفعاؤنا عند الله﴾ دەشڵێن: ئەوانە -دەیانپەرستین- لای خوا تكاكارمان دەبن، واتە: بۆ ئەو مەبەستە ئێمە ئەیانپەرستین ﴿قل اتنبئون الله بما لا یعلم فی السموات ولا فی الأرض﴾ بڵێ: ئاخۆ خەبەر بەخوا دەدەن بەشەریكێك خۆی نەزانێ پێی لە ئاسمانەكان و لە زەوییدا ؟! ﴿سبحانه وتعالی عما یشركون﴾ خوا پاك و خاوێن وبێخەوشە، بەرزو بڵندە لە هەرشتێك بێ باوەڕان دەیكەنە شەریك و هاوبەشی ﴿[19] وما كان الناس إلا امة واحدة﴾ لەسەرەتای ژیانەوە خەڵك هەموو یەك تیرەو، یەك ئوممەت بوون و، یەك ئایینیان هەبوو، ئایینی یەكخواپەرستیی ﴿فاختلفوا﴾ كەچی لە نێوان خۆیاندا ناكۆكبوون و لێكترازان ! (ئیبن عەبباس) دەڵێ: نێوان (ئادەم) پێغەمبەرو (نووح) پێغەمبەر -سڵاویان لەسەر بێ- (١٠) سەدە بوو، خەڵكیش هەموو لەسەر دین و ئایینی خوای تاك وتەنیا بوون, پاشان ناكۆكی كەوتە نێوانیانەوەو هەق و ناهەقیان تێكەڵ كردو دەستیان دایە بت پەرستیی ، ئینجا خوا پەیامبەرانی -یەك لەدوای یەك- بۆ ناردن و لەناوخۆیشیاندا ناكۆكبوون ! ﴿ولولا كلمة سبقت من ربك﴾ وەئەگەر لەپێشدا بریارێك لە پەروەردگارتەوە دەرنەچووبا كە: هیچ خەڵكێك لەناو نەبات، تا ئاگادار نە كرێتەوەو پێغەمبەری بۆ نەیەت ﴿لقضی بینهم فیما كانوا فیه یختلفون﴾ ئێستا داوەریی ئەو ناكۆكیە كرابوون كە كێشەیان بوو تێیدا ﴿[20] ویقولون لولا انزل علیه آیة من ربه﴾ هاوبەشدانەرەكان دەڵێن: باشە! بۆچی لەلایەن پەروەردگاریەوە بەڵگەو نیشانەیەكی بۆ نەهاتە خوارەوە شایەتی ڕاستیی بۆ بدات ؟! ﴿فقل إنما الغیب لله﴾ جا تۆ بڵێ: دەستێوەردانی گشت كارێكی نادیارو غەیب هەر بۆخوایە، واتە: هەر ئەو غەیب دەزانێ و، دەتوانی بەڵگەو موعجیزە بنێری ﴿فانتظروا﴾ جائێوە چاوەڕوانی بڕیاری خوابن ﴿إني معكم من المنتظرین﴾ وا منیش لەگەڵ ئێوە بێ شك چاوەڕوان دەبم.

الجزء الحادي عشر — سورة يونس

وَإِذَآ أَذَقۡنَا ٱلنَّاسَ رَحۡمَةٗ مِّنۢ بَعۡدِ ضَرَّآءَ مَسَّتۡهُمۡ إِذَا لَهُم مَّكۡرٞ فِيٓ
ءَايَاتِنَاۚ قُلِ ٱللَّهُ أَسۡرَعُ مَكۡرًاۚ إِنَّ رُسُلَنَا يَكۡتُبُونَ مَا تَمۡكُرُونَ
(٢١) هُوَ ٱلَّذِي يُسَيِّرُكُمۡ فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِۖ حَتَّىٰٓ إِذَا كُنتُمۡ فِي ٱلۡفُلۡكِ
وَجَرَيۡنَ بِهِم بِرِيحٖ طَيِّبَةٖ وَفَرِحُواْ بِهَا جَآءَتۡهَا رِيحٌ عَاصِفٞ
وَجَآءَهُمُ ٱلۡمَوۡجُ مِن كُلِّ مَكَانٖ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ أُحِيطَ بِهِمۡ دَعَوُاْ
ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ لَئِنۡ أَنجَيۡتَنَا مِنۡ هَٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ
ٱلشَّٰكِرِينَ (٢٢) فَلَمَّآ أَنجَىٰهُمۡ إِذَا هُمۡ يَبۡغُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ
ٱلۡحَقِّۗ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّمَا بَغۡيُكُمۡ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمۖ مَّتَٰعَ ٱلۡحَيَوٰةِ
ٱلدُّنۡيَاۖ ثُمَّ إِلَيۡنَا مَرۡجِعُكُمۡ فَنُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ (٢٣)
إِنَّمَا مَثَلُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا كَمَآءٍ أَنزَلۡنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخۡتَلَطَ بِهِۦ
نَبَاتُ ٱلۡأَرۡضِ مِمَّا يَأۡكُلُ ٱلنَّاسُ وَٱلۡأَنۡعَٰمُ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَخَذَتِ ٱلۡأَرۡضُ
زُخۡرُفَهَا وَٱزَّيَّنَتۡ وَظَنَّ أَهۡلُهَآ أَنَّهُمۡ قَٰدِرُونَ عَلَيۡهَآ
أَتَىٰهَآ أَمۡرُنَا لَيۡلًا أَوۡ نَهَارٗا فَجَعَلۡنَٰهَا حَصِيدٗا كَأَن لَّمۡ تَغۡنَ
بِٱلۡأَمۡسِۚ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ (٢٤) وَٱللَّهُ
يَدۡعُوٓاْ إِلَىٰ دَارِ ٱلسَّلَٰمِ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ (٢٥)

٢١١

**هەر كە كەوتنەوە فەرحانە، گزیی دەكەنەوە:**

﴿[21] وإذا أذقنا الناس رحمة من بعد ضراء مستهم﴾ هەركە بەو خەڵكە خۆشیی و ڕەحمەتێ دەچێژین ، پاش زیان و ناخۆشییەك تووشیان دەبێت ﴿إذا لهم مكر فی آیاتنا﴾ كەچی خێرا دەبینی بەرامبەر نیشانەو ئایەتەكانمان گزیی وفرت و فیڵ و مەكر دەكەن !﴿قل الله اسرع مكرا﴾ بڵێ: خوا لەوان بەپەلە تر نەخشە بۆ لەناو بردنیان دادەنێت ، وردە وردە لە گەڵیان ئەڕوات تا كتوپڕ ئەیانگرێت ﴿إن رسلنا یكتبون ما تمكرون﴾ بێگومانبن هەر فرت و

فێڵیٚ بکەن فریشتەکانمان ئەینووسن و تۆماری ئەکەن ﴿[22] هوالذی یسیرکم فی البر والبحر﴾ هەر ئەو زاتەیە کە ئێوە لە *وشکانیی* و، لە دەریادا – بۆ بەدەس هێنانی ڕزق و ڕۆزی و سەیران و سەفا– دەگێڕیٚ ﴿حتی إذا کنتم فی الفلك﴾ جائەو حەلە کە لەکەشتییەکاندان ﴿وجرین بهم بریح طیبة﴾ و بایەکی خۆش وسازگار بەرەو مەبەست کەشتییەکان بەوانیشەوە دەبات ﴿وفرحوا بها﴾ و پێی خۆشحاڵ دەبن ﴿جاءتها ریح عاصف﴾ ئالەو دەمەدا باوتۆفێکی توندو سەخت بۆی بێت ﴿وجاءهم الموج فی کل مکان﴾ و شەپۆلیش لەگشت لایەکەوە بۆیان بێت ﴿وظنوا انهم احیط بهم﴾ و چاکیش زانییان کەوتوونەتە ناوگێژاوی دەریاو دەوریان گیراوە و، تیاچوونیان لەبەر دەمدایە ﴿دعوا الله مخلصین له الدین﴾ زۆر بەدڵ دڵسۆزیی و ملکەچییەوە هاوار لەخوا دەکەن ولێیدەپاڕێنەوە دەڵێن: ﴿لئن انجیتنا من هذه لنکونن من الشاکرین﴾ خوایە ! سوێند بیٚ ئەر لەم بەڵایە ڕزگارمان بکەیت، شوکرانە بژێرین و، جارێکی تر لاساریی نەکەین ﴿[23] فلما انجاهم﴾ جا کەڕزگاریکردن لەو گرفتە پێشیان هاتبوو ﴿إذا هم یبغون فی الأرض بغیر الحق﴾ بە پەلەو بەشێوەیەکی نارەواو ناهەق، دەسدەکەنەوە بە کاری فەسادو خراپەکاریی لە زەویدا ﴿یا أیها الناس إنما بغیکم علی انفسکم﴾ ئەی خەڵکینە! چاك بزانن کە: بەڕاستیی ئەم خراپەکاریی و دەست درێژییەتان ، ئۆباڵ و زیانەکەی هەر بۆ خۆتانە ﴿متاع الحیاة الدنیا﴾ لەزەت و خۆشییەکی کەمی ژیانی ئەم دنیایە ﴿ثم إلینا مرجعکم﴾ لەپاشان هەربۆلای خۆمان دێنەوە ﴿فننبئکم بما کنتم تعملون﴾ ئینجا لەوەی کردووتانە ئاگادارتان دەکەین، پاشانیش بەپێی ئەوە پاداش و تۆڵە دەدرێنەوە.

**وریابن! ژیانی دنیا لە خشتەتان نەبا:**

﴿[24] إنما مثل الحیاة الدنیا﴾ بێگومان نموونەی ژیانی ئەم دنیایە ﴿کماء انزلناه من السماء﴾ هەر وەکو ئەو بارانە وایە کە: لە ئاسمانەوە دەیبارێنین ﴿فاختلط به نبات الأرض﴾ ڕووەکی هەمەڕەنگی زەوی پێدەڕوی ﴿مما یأکل الناس والأنعام﴾ لەوەی مرۆڤ و مەڕو ماڵات دەیخۆن ﴿حتی إذا اخذت الأرض زخرفها﴾ هە تا ئەودەمەی زەوی بۆخۆی ڕەنگاو ڕەنگ دەبیٚ و، جوانی خۆی دەر دەخا ﴿وازینت﴾ و خۆی ئاراییشدەدا ﴿وظن اهلها انهم قادرون علیها﴾ و خاوەنەکەی وا دەزانیٚ لە ژێر دەسەڵاتی ئەودایەو، چۆنی بویٚ دەتوانیٚ سوودی لێوەرگریٚ و، هیچ کەسێك نییە لێی تێك بدات!!" ﴿أتاها امرنا لیلا أونهارا﴾ جا لەناکاو بەشەو، یان بەڕۆژ ، فەرمانی ئێمە بۆ وێرانکردنی دێت (گڕەبا، یاِن برووسکە لێیدەدا)و دەیسووتێنیٚ ﴿فجعلناها حصیدا﴾ وای لێدەکەین دەڵێیت درووێنەکراوە ﴿کأن لم تغن بالأمس﴾ وادەزانی دوێنێ نەبووە ﴿کذلك نفصل الآیات لقوم یتفکرون﴾ ئێمە ئابەو شێوەیە نیشانەو بەڵگەکانی خۆمان بۆ خەڵکیٚ بیربکاتەوەو عیبرەت وەرگریٚ شیدەکەینەوە. بەڵیٚ.. وێنەو نموونەی ڕازاوەیی و جوانی ئەم دنیایەو، پاشان وێرانبوونی و تیاچوونی لەچەند جێگایەکی تردا باسکراوە، بۆ نموونە: لە سوورەتی(١٨/٤٥)دا دەفەرمویٚ:(واضرب لهم مثل الحیاة الدنیا کماء انزلناه من السماء..وکان الله علی کل شیء مقتدرا) یان دەفەرمویٚ:(..ثم یهیج فتراه مصفرا ثم یجعله حطاما إن فی ذلك لذکری لأولی الألباب) زمر:٢١ ٠ یان دەفەرمویٚ: (..کمثل الغیث أعجب الکفار نباته ثم یهیج فتراه مصفرا ثم یکون حطاما..) حدید/٢٠. بەڵیٚ...ئەمە مەسەلەی ژیانی ئەم دنیایە، دەسا ئێوەیش گشت وریابن، تا ئەو دنیایە دەسخەڕۆتان نەکات ﴿[25] والله یدعو إلی دار السلام﴾ خوایش بۆ ماڵی ئاشتیی و سەلام، واتە: بۆ بەهەشتی

خۆی، بانگ دەکا ﴿ویهدی من یشاء إلی صراط مستقیم﴾ و هەر کەسێکیش ئەوخۆی بیەوێ و، بەشیاوی بزانێت، ڕێنمایی دەکات بۆ ڕێگە ڕاستەکەی قورئان ﴿[٢٦] للذین احسنوا الحسنی﴾ بۆ ئەوانەش چاکە دەکەن، پاداشی زۆرچاك و بەهەشت هەیە ﴿وزیادة﴾ وەزیاد لەوەش، واتە: دیتنی ڕووی پیرۆزی خوای میهرەبان و تەماشا کردنیی! ﴿ولا یرهق وجوههم قتر ولاذلة﴾ و تۆزو غۆبارو سەرشۆڕی لە دەم و چاویان نانیشێ، هەرچۆنێ لەدەم و چاوی دۆزەخییەکان دەنیشێ ﴿اولئك اصحاب الجنة﴾ ئەوانە یارانی بەهەشتن ﴿هم فیها خالدون﴾ و بەهەتا هەتاییش تێیدا دەمێننەوەو لێیدەرناچن ﴿[٢٧] والذین کسبوا السیئات﴾ ئەوانەش وا لەدونیادا کاری خراپەدەکەن و، لەسەر شیرکی خۆیان بەردەوام دەبن ﴿جزاء سیئة بمثلها﴾ تۆڵەی گشت خراپە یەکیان بە ئەندازەی ئەوخراپەیە کردوویانەو بۆیان زیاد ناکرێ، وەك بۆ چاکەکاران لە پاداشی چاکەیاندا زیاد دەکرێ ﴿وترهقهم ذلة﴾ وە زەبوونی دایان دەگرێت ﴿ما لهم من الله من عاصم﴾ هیچ پارێزەرێکیش نییە لە تۆڵەی خوا لایان بدا ﴿کأنما اغشیت وجوههم قطعا من اللیل مظلما﴾ دەم و چاویان وا ڕەش هەلدەگەڕێ، دەڵێیت: تاریکستانی شەو دایپۆشیوە ﴿اولئك اصحاب النار﴾ ئەوانە دەبنە یارو هاوڕێی ئاگری دۆزەخ ﴿هم فیها خالدون﴾ بە هەتا هەتاییش تێیدا دەمێننەوە.

**پەرستراوەکان لە پەرستیارەکانیان حاشا دەکەن:**

﴿[٢٨] ویوم نحشرهم جمیعا﴾ ئەو ڕۆژە وەبیر بێنە کە هەموو بەتێکڕا بۆ لێپرسینەوە! کۆ دەکەینەوە. بۆجەخت لەسەر ئەمە لەسوورەتی (کەهف/٤٧) یشدا هاتووەو دەفەرموێ: (وحشرناهم فلم نغادر منهم أحدا) ﴿ثم نقول للذین اشرکوا﴾ پاشان بەوانەی وا هاوبەشیان بۆ خوا دانا دەڵێین: ﴿مکانکم انتم وشرکاؤکم﴾ ئێوە خۆتان و هاوبەش و پەرستراوەکانتان لەجێی خۆتانبن و نەجووڵێن، تا خوا بڕیاری یەکجاریتان بۆ دەدات ﴿فزیلنا بینهم﴾ ئینجا ئێمەیش لێکیان دەکەینەوە" هاوبەشدانەرو پەرستراو، واتە: پەیوەندی خۆیی و خزمایەتی نێوانیان ناهێڵین ﴿وقال شرکاؤهم﴾ و ئەو حەلە پەرستراوەکانیان (هەرشتێك بن: فریشتە، شەیتان ، داروو بەرد..) بەپەرستیارەکان دەڵێن: ﴿ماکنتم إیانا تعبدون﴾ هەرگیز ئێوە پەرستشی ئێمەتان نەکردووە! پەرستیارەکانیش ئەڵێن: بەڵێ.. بێگومانە کە ئێوەمان پەرست، ئەوجا پەرسراوەکان دەڵێن: ﴿[٢٩] فکفی بالله شهیدا بیننا وبینکم﴾ تەنها خوا لەنێوانماندا شایەتبێ بەسە ﴿إن کنا عن عبادتکم لغافلین﴾ دڵنیابن ئێمە لە پەرستنی ئێوە بێ ئاگاو غافڵبووین ﴿[٣٠] هنالك تبلوا کل نفس



الحزب ٢٢
۞ لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ ٱلْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ وَلَا يَرْهَقُ وُجُوهَهُمْ قَتَرٌ
وَلَا ذِلَّةٌ أُو۟لَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلْجَنَّةِ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ﴿٢٦﴾ وَٱلَّذِينَ
كَسَبُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ جَزَآءُ سَيِّئَةٍۭ بِمِثْلِهَا وَتَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ مَّا لَهُم مِّنَ
ٱللَّهِ مِنْ عَاصِمٍ كَأَنَّمَآ أُغْشِيَتْ وُجُوهُهُمْ قِطَعًا مِّنَ ٱلَّيْلِ مُظْلِمًا
أُو۟لَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ﴿٢٧﴾ وَيَوْمَ نَحْشُرُهُمْ
جَمِيعًا ثُمَّ نَقُولُ لِلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ مَكَانَكُمْ أَنتُمْ وَشُرَكَآؤُكُمْ فَزَيَّلْنَا
بَيْنَهُمْ وَقَالَ شُرَكَآؤُهُم مَّا كُنتُمْ إِيَّانَا تَعْبُدُونَ ﴿٢٨﴾ فَكَفَىٰ بِٱللَّهِ
شَهِيدًۢا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ إِن كُنَّا عَنْ عِبَادَتِكُمْ لَغَـٰفِلِينَ ﴿٢٩﴾
هُنَالِكَ تَبْلُوا۟ كُلُّ نَفْسٍ مَّآ أَسْلَفَتْ وَرُدُّوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ مَوْلَىٰهُمُ
ٱلْحَقِّ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴿٣٠﴾ قُلْ مَن يَرْزُقُكُم
مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ أَمَّن يَمْلِكُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَـٰرَ وَمَن يُخْرِجُ
ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَىِّ وَمَن يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ
فَسَيَقُولُونَ ٱللَّهُ فَقُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٣١﴾ فَذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمُ ٱلْحَقُّ
فَمَاذَا بَعْدَ ٱلْحَقِّ إِلَّا ٱلضَّلَـٰلُ فَأَنَّىٰ تُصْرَفُونَ ﴿٣٢﴾ كَذَٰلِكَ
حَقَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ عَلَى ٱلَّذِينَ فَسَقُوٓا۟ أَنَّهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٣﴾

﴿ما أسلفت﴾ ئیتر لەوێ هەموو کەسێك گیرۆدەی ئەوە دەبێت پێشی خۆیخستووە، وە بەوەیش پاداش و تۆڵە وەردەگرێت، واتە: بە چاك و خراپی خۆی، پاداش و تۆڵە ئەدرێتەوە. بەڵێ.. گیرۆدە بوونی مرۆڤ بەوشتانە پێشی خۆی خستووە, لە سوورەتگەلێکی قورئاندا هاتووە، بۆ نموونە: لەسوورەتی (١٣/٧٥) دا دەفەرموێ: (ینبأ الإنسان یومئذ بما قدم وأخر) وەلەسوورەتی (٩/٨٦) دا دەفەرموێ:(یوم تبلی السرائر) وە لەسوورەتی (١٧/١٣-١٤) دا دەفەرموێ:(ونخرج له یوم القیامة کتابا یلقاه منشورا، إقرأ کتابك کفی بنفسك الیوم علیك حسیبا) وە لە سوورەتی (١٨/٩٤) دا هاتووەو دەفەرموێ:(ویقولون یا ویلتنا مالهذا الکتاب..) ﴿وردوا إلى الله مولاهم الحق﴾ و هەموو بەرەو لای خوای گەورەو، سەرپەرستیاری راستەقینەیان دەبرێنەوەو، ئەوجا دەردەکەوێ کە: ئەوانە خوا نەبوون و، بەناهەق کرابوونە خوا! ﴿وضل عنهم ما کانوا یفترون﴾ هەردرۆو پروپاگانتەیەکیان کردبوو، کەگوایە بتەکان تکایان بۆ ئەکەن، گوم دەبێ و بەفیرۆ دەچێت.

**موشریکیش ددان بەتاك و تەنیایی خوادا دەنێ:**

﴿[٣١] قل من یرزقکم من السماء والأرض﴾ بڵێ: کێ لەم ئاسمان و زەوییەدا رزق و رۆزیتان دەداتێ ؟ ﴿أمن یملك السمع والأبصار﴾ کێیە دروستکەرو خاوەنی ئەوگوێ و چاوانەتان؟ ﴿ومن یخرج الحی من المیت﴾ ئەی کێیە زیندوو لەمردوو دەردێنێ ؟ ﴿ویخرج المیت من الحی﴾ و مردوو لە زیندو دەردەکا؟ ﴿ومن یدبر الأمر﴾ وە کێیە زۆر بەوردیی بۆکاروباری ئەم دونیایە نەخشە دەکێشێ ؟ ﴿فسیقولون الله﴾ بەزوویی لەوەڵامی هەموو ئەمانەدا دەڵێن: هەرخوایە هەموو ئەوانە دەکات ﴿فقل أفلا تتقون﴾ بڵێ: دەسا بۆ لە خوا خۆ ناپارێزن و ناترسن؟ بەڵێ.. (موشریك)ـەکانیش ددان بە (ربووبییەت)ی خوای گەورەدا دەنێن، دەزانن بەدیهێنەری بوونەوەر بەتێکڕا هەرخوایە، بۆنموونە: لەسوورەتی(٤٣ /٩)دا دەفەرموێ: (ولئن سألتهم من خلق السموات والأرض لیقولن خلقهن العزیز العلیم) وە لەسوورەتی (٤٣/٨٧)دا دەفەرموێ: (ولئن سألتهم من خلقهم لیقولن الله...) وە لەسوورەتی (٢٣/٨٤-٨٥)دا دەفەرموێ: (قل لمن الأرض ومن فیها إن کنتم تعلمون سیقولون لله قل أفلا تذکرون) کەچی لەگەڵ ئەوەیشدا هەرشەریك و هاوبەشی بۆ دادەنێن و ددان بە(ئولووهیەت)یدا نانێن، بۆیە دەچن لێرەو لەوێ بەرنامەی ئەم وئەو دەخوازن و پەیرەوی دەکەن و! خۆیان چەواشە کردووە، لەلایەکەوە دەڵێن ئەم بوونەوەرە خوای باڵادەست بەدیهێناوە، کەچی بۆ ژیان و کاروباری سیاسەت پەیرەوی لە خەڵکی تر دەکەن! ﴿[٣٢] فذلکم الله ربکم الحق﴾ ئەو خوا دەسەڵاتدارەیە پەروەردگاری راستەقینەی ئێوە، نەك ئەوبتانە کە لەباتی ئەو دەیانپەرستن ﴿فماذا بعد الحق إلا الضلال﴾ جا ئیتر بەدەر لەگومڕایی - پاش هەق و راستیی, کە هەر لەپەرستنی خوادایە- چیتر هەیە ؟ ﴿فأنی تصرفون﴾ ئەی ئیتر چۆن لەرێی راستی یەکخوا پەرستی کلادەبن و لادەدرێن؟ ﴿[٣٣] کذلك حقت کلمة ربك على الذین فسقوا﴾ ئابەو جۆرەیە بڕیاری پەروەردگارت لەبەرامبەر ئەو لەسنوور دەرچووانەوە وەڕاست گەڕا ﴿أنهم لا یؤمنون﴾ کە بێگومان ئەوانە باوەڕناکەن و ئیمان ناهێنن ﴿[٣٤] قل هل من شرکائکم من یبدأ الخلق﴾ بڵێ: ئاخۆ لەناو پەرستراوەکانی ئێوەدا کەسێك هەبێ بتوانێ، بێبناغەو لەنوێ شتێك بەدی بهێنێ ﴿ثم یعیده﴾ لەپاشان دوای تیاچوونی وەکو خۆی لێبکاتەوەو لە نوێ دەستی پێ بکاتەوە؟ ﴿قل الله یبدأ الخلق ثم یعیده﴾ بڵێ: هەر خوا

(اللـه)یـه بتوانیٚ لەسـەرەتاوە -بـیٚ بنـەڕەت و بناغـە- گشـت خـەڵك بـەدیبیٚنی و، پاشـانیش سـەر لـەنویٚ دەسـتی پیٚبکاتەوەو، گیانی بەبەرا بکاتەوە ﴿فأنی تؤفکون﴾ دەسا چۆن لـەخوا پەرستیی کلادەبن و لادەدریٚن؟! لـەم چەند ئایەتانـەی تریشـدا هەرئـەو مانـاو مەبەسـتە زۆر بـەروونی بەدیـدەکریٚ، بۆنموونـە: لـە سـوورەتی(٣٠ /٤٠) دا دەفەرمویٚ:(الله الذی خلقکم ثم رزقکم ثم یمیتکم ثم یحییکم هل من شرکائکم من یفعل من ذلکم من شئ سبحانه وتعالی عما یشرکون) وە لە سوورەتی(٢٥ /٣) دا دەفەرمویٚ: (واتخذوا من دونه آلهة لایخلقون شیئا وهم یخلقون ولا یملکون لأنفسهم ضرا ولا نفعا ولایملکون موتاً ولا حیاةً ولا نشوراً) وە لەسوورەتی(٣٥ /٣) دا دەفەرمویٚ: (یا أیها الناس اذکروا نعمة الله علیکم هل من خالق غیر الله یرزقکم من السماء والأرض..) یـان دەفـەرمویٚ: (أفمن یخلق کمن لایخلق..) سوورەتی (١٦/ ١٧) یان دەفەرمویٚ: (أم جعلوا لله شرکاء خلقوا کخلقه...) سوورەتی١٣/ ١٦) یـان دەفـەرمویٚ ( :قل افرأیتم ما تدعون من دون الله إن أرادنی الله بضر هل هن کاشفات ضره..)سوورەتی (٣٩/ ٣٨).یـان دەفـەرمویٚ: (أمن هذا الذی یرزقکم من السماء والأرض..) سوورەتی/ملك. یـان دەفەرمویٚ: (أمن هذا الذی یرزقکم إن أمسك رزقه..)سوورەتی ٢١/٦٧. ﴿[٣٥] قل هل من شرکائکم من یهدی إلى الحق﴾ بڵـیٚ: ئـاخۆ لـەناو هاوبـەش و پەرسـتراوەکانتاندا کەسـی واهـەبیٚ بتـوانیٚ ڕیٚبـەری بۆهـەق و ڕاسـتیی بکـات ؟ ﴿قـل الله یهـدی للحق﴾ بڵیٚ: هەر خوایە کە بتوانیٚ ڕابەریی بۆهەق و ڕاستیی بکـات" نـەك کەسـیٚکی تـر" ﴿افمـن یهـدی إلى الحـق﴾ دەسـا کەسیٚك کە بتوانیٚ ڕیٚبـەریی هـەق و ڕاسـتیی بکـات ﴿احق أن یتبـع﴾ شـیاوترە پـەیڕەوی بکریٚـت ؟ ﴿امـن لا یهـدی إلا أن یهدی﴾ یان ئەو کەسەی کە بۆ خۆیشـی ڕیٚ نـەزانیٚ ، مەگـەر ڕیٚی نیشان بدریٚ ؟ واتە: ئەو بتانەی ئیٚوە کـە ئیٚرە بۆ ئـەویٚ ڕیٚدەرناکـەن ، هیٚـژاترن بۆپـەیڕەوی کـردن ، یـان ئەوخوایـە کەئـەو هـەموو دەسـەڵاتەی هەیـە؟ ﴿مالکم کیف تحکمون﴾ چیتانە؟ چۆن بڕیاری وا دەدەن و، داوەریی وا دەکـەن؟!. ﴿[٣٦] وما یتبع اکثرهم إلا ظنا﴾ زۆرینـەی هاوبـەش دانـەران هەر لەگومان پەیڕەوی دەکەن"واتە: هیچ بەڵگەیەکی ئەو تۆیان نییە" کە ئەوانە شتیٚکیان بەدەس بیٚ، بیٚ لەخەیاڵ " ﴿إن الظن لا یغنی من الحق شیئا﴾ خۆ گومـانیش سـەبارەت بـە هـەق و ڕاسسـتیی هـیچ ناهیٚنی و، سزای خوا لە کۆڵناکاتەوە ﴿إن الله علیم بما یفعلون﴾ بە ڕاستی خوا بەو کارەی هاوبەشدانەرەکان ئەیکەن بەئاگاو زانایە.

الجزء الحادي عشر — سُورَةُ يُونُسَ

قُلْ هَلْ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ۚ قُلِ ٱللَّهُ يَبْدَؤُا۟
ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ۖ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ ﴿٣٤﴾ قُلْ هَلْ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن يَهْدِىٓ
إِلَى ٱلْحَقِّ ۚ قُلِ ٱللَّهُ يَهْدِى لِلْحَقِّ ۗ أَفَمَن يَهْدِىٓ إِلَى ٱلْحَقِّ أَحَقُّ أَن
يُتَّبَعَ أَمَّن لَّا يَهِدِّىٓ إِلَّآ أَن يُهْدَىٰ ۖ فَمَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿٣٥﴾
وَمَا يَتَّبِعُ أَكْثَرُهُمْ إِلَّا ظَنًّا ۚ إِنَّ ٱلظَّنَّ لَا يُغْنِى مِنَ ٱلْحَقِّ شَيْـًٔا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ
عَلِيمٌۢ بِمَا يَفْعَلُونَ ﴿٣٦﴾ وَمَا كَانَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ أَن يُفْتَرَىٰ مِن دُونِ
ٱللَّهِ وَلَٰكِن تَصْدِيقَ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ ٱلْكِتَٰبِ لَا رَيْبَ
فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٣٧﴾ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ۖ قُلْ فَأْتُوا۟ بِسُورَةٍ
مِّثْلِهِۦ وَٱدْعُوا۟ مَنِ ٱسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٣٨﴾
بَلْ كَذَّبُوا۟ بِمَا لَمْ يُحِيطُوا۟ بِعِلْمِهِۦ وَلَمَّا يَأْتِهِمْ تَأْوِيلُهُۥ ۚ كَذَٰلِكَ كَذَّبَ
ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٣٩﴾
وَمِنْهُم مَّن يُؤْمِنُ بِهِۦ وَمِنْهُم مَّن لَّا يُؤْمِنُ بِهِۦ ۚ وَرَبُّكَ أَعْلَمُ
بِٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٤٠﴾ وَإِن كَذَّبُوكَ فَقُل لِّى عَمَلِى وَلَكُمْ عَمَلُكُمْ ۖ
أَنتُم بَرِيٓـُٔونَ مِمَّآ أَعْمَلُ وَأَنَا۠ بَرِىٓءٌ مِّمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٤١﴾ وَمِنْهُم مَّن
يَسْتَمِعُونَ إِلَيْكَ ۚ أَفَأَنتَ تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ وَلَوْ كَانُوا۟ لَا يَعْقِلُونَ ﴿٤٢﴾

٢١٣

**ئەم قورئانە ناشیٚ هی خوا نەبیٚ:**

﴿[٣٧] وما کان هذا القرآن ان یفتری من دون الله﴾ بە هیچ شیٚوەیەك نابیٚ و ناگونجیٚ ئەم قورئانـە هـی خوانـەبیٚ و، بە درۆو ئیفتیرا هەڵبەسرابیٚت، واتە: تەنها خوا بۆخۆی دەتوانیٚ قورئانی ئاوا بنیٚریٚ، ئیتر هیچ کەسیٚکی تر ناتوانیٚ کاری وابکـات ﴿ولکن تصدیق الذی بین یدیه﴾ بەڵکو هـی خوایـەو، تەسدیقی (تـەورات) و (ئینجیل)یـش دەکـات

﴿وتفصيل الكتاب﴾ وروونكەرەوەی هەموو كتێبە ئاسمانیەكانیشە ﴿لا ريب فيه من رب العالمين﴾ هیچ گومانێكی تێدانیە كە لەلایەن پەروەردگاری جیهانەكانەوەیە. بەڵێ.. ئەو ڕاستییە لە چەند ئایەتێكی دیكەدا هاتووە، بۆنمونە: (لقد كان في قصصهم عبرة لأولي الألباب، ما كان حديثا يفترى ولكن تصديق الذي بين يديه وتفصيل كل شيء وهدى ورحمة لقوم يومنون) سوورەتی١٢ / ١١١)یان دەفەرموێ: (وما تنزلت به الشياطين، وما ينبغي لهم وما يستطيعون) سوورەتی (٢٦/٢١٠-٢١١). یان دەفەرموێ :(وبالحق أنزلناه وبالحق نزل) سوورەتی(١٠٥/١٧). یان دەفەرموێ:(أم يقولون افتراه قل فأتوا بسورة من مثله وادعوا من استطعتم من دون الله إن كنتم صادقين) سوورەتی(٣٨/١٠).یان دەفەرموێ:(وإن كنتم في ريب مما نزلنا على عبدنا فأتوا بسورة من مثله) سوورەتی(٢٢/٢).یان دەفەرموێ:(أم يقولون افتراه قل فأتوا بعشر سور مثله مفتريات)هود/١٣.یان دەفەرموێ:(قل لإن اجتمعت الإنس والجن على أن ياتوا بمثل هذا القراءن لا يأتون بمثله ولو كان بعضهم لبعض ظهيرا) سوورەتی١٧/٨٨. ﴿[٣٨] أم يقولون افتراه﴾ یان دەڵێن: (موحەممەد) ﷺ خۆی هەڵیبەستووە لە سەرخوا !! ﴿قل فأتوا بسوره مثله﴾ تۆش بڵێ: دەسا ئەگەر وایە كە ئێوە دەیڵێن، فەرموون تەنیا سوورەتێك وەك ئەو بێنن، كە لە هەموو ڕوویەكەوە لەو بچێ ﴿وادعوا من استطعتم من دون الله﴾ بێجگە لەخوا، هەركەسێك ئەتوانن هاواری بۆ بەرن و، داوای یارمەتی لێ بكەن بۆ ئەوكارە ﴿إن كنتم صادقين﴾ ئەگەر ڕاست ئەكەن ئەڵێن: تۆ خۆت هەڵت بەستووە لە سەرخوا ﴿[٣٩] بل كذبوا بما لم يحيطوا بعلمه﴾ نەخێر، كە باوەڕیش ناهێنن هی ناتەواوی قورئان نیە بەڵكو بەدرۆی دەزانن و لە ماناو مەبەستەكانی تێنەگەیشتوون ﴿ولما يأتهم تأويله﴾ وهێشتا ڕاستییشیان بۆ دەر نەكەوتووە، واتە: ئەنجامی هەڕەشەكانی قورئانیان بۆ پێش نەهاتووە، هەق بوو چاوەڕوابن و پەلەنەكەن، وەكو لە سوورەتی (ئەعراف/٥٣)دا دەفەرموێ: (هل ينظرون إلا تأويله يوم يأتي تأويله يقول الذين نسوه من قبل قد جاءت رسل ربنا بالحق فهل لنا من شفعاء..) وە دەفەرموێ: (بل هم في شك من ذكري بل لما يذوقوا عذاب) ٣٨/٠٨ ﴿كذلك كذب الذين من قبلهم﴾ هەرئاوا ئەوانەش لە پێشیانەوەبوون ، باوەڕیان بەهەڕەشەكانی خوا نەكردو، پێغەمبەرەكانیان بەدرۆزن دانا ﴿فانظر كيف كان عاقبة الظالمين﴾ سا بروانەو چاك بزانە ئەنجامی ستەمكارانی گەلانی پێشوو چۆن بوو؟ ﴿[٤٠] ومنهم من يؤمن به﴾ لەو خەڵكەدا هی وا هەیە لە ئایندەدا باوەڕی پێدێنێ ﴿ومنهم من لا يؤمن به﴾ وهەیشیانە باوەڕی پێ ناهێنێ و، لەسەر كوفری خۆی سووردەبێت ﴿وربك أعلم بالمفسدين﴾ وە پەروەردگارت لەهەموو كەس باشتر بەحاڵی خراپەكاران و بێ باوەڕان دەزانێت .

## بێزاری لەموشریكان:

﴿[٤١] وإن كذبوك فقل لي عملي﴾ ئەگەر بڕوایان پێ نەكردیت ، پێیان بڵێ: پاداشی كارو كردەوەی خۆم بۆ خۆم ﴿ولكم عملكم﴾ وتۆڵەی كاروكردەوەی ئێوەیش بۆ خۆتان ﴿انتم بريئون مما اعمل﴾ ئێوە لەوكارە من ئەیكەم تەریك و بەریین ﴿وانا برئ مما تعملون﴾ و منیش لەوكارەی ئێوە ئەیكەن تەریك و بەرییم . بەڵێ.. ئەو بێزاریی و نكووڵی دەربڕیینە لە پەرستنی غەیری خوا لە گەلێ ئایەتی تردا هاتووە، بۆنموونە خوا دەفەرموێ: (قل ياأيها الكافرون... لكم دينكم ولي دين)١٠٩/٦. دەفەرموێ: (إنا براءوا منكم ومما تعبدون من دون الله..) سوورەتی٦٠/٤. ﴿[٤٢] ومنهم من يستمعون إليك﴾ وە لەنێوانیاندا هەن بەڕواڵەت گوێت بۆ دەگرێ ، بەڵام بەدڵ وەری ناگرن و مەبەستیان نیەودەڵێی كەڕن ﴿افأنت تسمع الصم﴾ تۆ دەتەوێ بەخەڵكی كەڕ قورئان ببیسێنی ﴿ولو كانوا لا يعقلون﴾ ئەر تێشنەگەن ؟ واتە: تۆقەت ناتوانی هیدایەتی ئەوجۆرە كەسانە بدەیت ﴿[٤٣] ومنهم من ينظر إليك﴾ و هەیانە

بۆتدەڕوانیٚ و نیشانەی پەیامبەراتیت لیٚدەبینیٚ و ئەزانیٚ تۆ پیٚغەمبەریت, بەلاٚم پیٚی هیدایەت نابن ﴿افأنت تهدی العمی﴾ تۆ دەتەویٚ خەلٚکانی کویٚر شارەزا بکەیت و، بیانخەیتە سەر ڕیٚی ڕاست و دروست ﴿ولو كانوا لا یبصرون﴾ ئەگەر نەشبینن ؟ ﴿[٤٤] إن الله لا یظلم الناس شیئا﴾ بە ڕاستیی خوا هیچ جۆرە ستەمیٚك لەوخەلٚکە ناکا ﴿ولكن الناس انفسهم یظلمون﴾ بەلاٚم ئەو خەلٚکە خۆیان ستەم لەخۆیان دەکەن و، دەست لەڕیٚی ڕاست بەردەدەن, بۆیە بەد بەخت دەبن.

**لەبەر سەختی قیامەت وا دەزانن تەنیا ڕۆژیٚ ژیاون:**

﴿[٤٥] ویوم یحشرهم﴾ ئەوڕۆژە وەبیربیٚنە کەخوا هەمووکافران کۆ دەکاتەوە بۆ وەرگرتنی تۆلٚەی کارەکانیان ﴿كأن لم یلبثوا إلا ساعة من النهار﴾ وا دەزانن لەبەر سەختی ئەو ڕۆژە تەنها ساتیٚك لەدنیادا ماونەتەوە ﴿یتعارفون بینهم﴾ و لەنیٚو خۆیشیاندا یەکتر ئەناسن و بەردەبنە گلەیی و گازندە لەیەکتر، ئەم دەلٚیٚت تاوانی تۆ بوو من وام لیٚهات، ئەوی دی دەلٚیٚت: نا، تاوانی تۆبوو وائیٚستا من گیرۆدە بووم، بەلاٚم ئەم گلەیی و گازندە چ کەلٚکیٚکی هەیە" ﴿قد خسر الذین كذبوا بلقاء الله﴾ ئەوانەی کە باوەڕیان بەلیٚقاو دیداری خوا نەکرد, دلٚنیابن زیانبارو ڕەنجەڕۆن ﴿وما كانوا مهتدین﴾ و ڕیٚیشیان دەر نەکرد لەدنیادا ، بۆیە ئیٚستا گیرۆدە بوون. وەك لەم چەند ئایەتانەشدا ئەو مەبەستە دوپاتکراوەتەوە، بۆنموونە: دەفەرمویٚ:(كأنهم یوم یرون ما یوعدون لم یلبثوا إلا ساعة من نهار) ئەحقاف/٣٥.وە دەفەرمویٚ: (كأنهم یوم یرونها لم یلبثوا إلا عشیة أو ضحاها). نازیعات/٤٦. وە دەفەرمویٚ: (یوم تقوم الساعة یقسم المجرمون ما لبثوا غیر ساعة..) ڕوم/٥٥. وە دەفەرمویٚ:(یتخافتون بینهم إن لبثتم إلا عشر ا) سوورەتی (١٠٣/٢٠). وە دەفەرمویٚ: (قالوا لبثنا یوما أوبعض یوم فاسأل العادین) سوورەتی ١١٣/٢٣.

الجزء الحادي عشر سورة يونس

وَمِنْهُم مَّن يَنظُرُ إِلَيْكَ أَفَأَنتَ تَهْدِي الْعُمْيَ وَلَوْ كَانُوا
لَا يُبْصِرُونَ ﴿٤٣﴾ إِنَّ اللَّهَ لَا يَظْلِمُ النَّاسَ شَيْئًا وَلَٰكِنَّ
النَّاسَ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٤٤﴾ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ كَأَن لَّمْ يَلْبَثُوا إِلَّا
سَاعَةً مِّنَ النَّهَارِ يَتَعَارَفُونَ بَيْنَهُمْ قَدْ خَسِرَ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِلِقَاءِ اللَّهِ
وَمَا كَانُوا مُهْتَدِينَ ﴿٤٥﴾ وَإِمَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ الَّذِي نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ
فَإِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ ثُمَّ اللَّهُ شَهِيدٌ عَلَىٰ مَا يَفْعَلُونَ ﴿٤٦﴾ وَلِكُلِّ
أُمَّةٍ رَّسُولٌ فَإِذَا جَاءَ رَسُولُهُمْ قُضِيَ بَيْنَهُم بِالْقِسْطِ وَهُمْ
لَا يُظْلَمُونَ ﴿٤٧﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا الْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ
﴿٤٨﴾ قُل لَّا أَمْلِكُ لِنَفْسِي ضَرًّا وَلَا نَفْعًا إِلَّا مَا شَاءَ اللَّهُ لِكُلِّ أُمَّةٍ
أَجَلٌ إِذَا جَاءَ أَجَلُهُمْ فَلَا يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ ﴿٤٩﴾
قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِنْ أَتَاكُمْ عَذَابُهُ بَيَاتًا أَوْ نَهَارًا مَّاذَا يَسْتَعْجِلُ مِنْهُ
الْمُجْرِمُونَ ﴿٥٠﴾ أَثُمَّ إِذَا مَا وَقَعَ آمَنتُم بِهِ آلْآنَ وَقَدْ كُنتُم بِهِ
تَسْتَعْجِلُونَ ﴿٥١﴾ ثُمَّ قِيلَ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا ذُوقُوا عَذَابَ الْخُلْدِ
هَلْ تُجْزَوْنَ إِلَّا بِمَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ ﴿٥٢﴾ ۞ وَيَسْتَنبِئُونَكَ
أَحَقٌّ هُوَ قُلْ إِي وَرَبِّي إِنَّهُ لَحَقٌّ وَمَا أَنتُم بِمُعْجِزِينَ ﴿٥٣﴾

ربع الحزب ٢٢

٢١٤ وَلَوْ أَنَّ لِكُلِّ

**تاوانباران لەدنیاو لەقیامەت تۆلٚە دەدریٚن:**

﴿[٤٦] وإما نرینك بعض الذی نعدهم﴾ و ئەر بەشیٚ لەوهەڕەشەیەت نیشان بدەین ئەی پیٚغەمبەر! بەلٚیٚنیان پیٚدەدەین و, ئیٚستا بەچاو ببینیت ﴿او نتوفینك﴾ یان پیٚش ئەوە کە نیشانتی بدەین بتمریٚنین ﴿فالینا مرجعهم﴾ جا لە هەردوو حالٚەکەدا هەرلای خۆمان دیٚنەوە ﴿ثم الله شهید علی ما یفعلون﴾ لە پاشانیش خوا بۆخۆی شایەت و بەئاگایە لەوکاروکردەوانە دەیکەن ، پیٚویست بە شایەدی تر ناکا ﴿[٤٧] ولكل امة رسول﴾ وەهەر هۆزو گەلیٚك پەیامبەریٚکی هەیەو بانگیان دەکات بۆ یەکخواپەرستیی، وەلەقیامەتیشدا دەبیٚتە شایەد لەسەریان ﴿فإذا جاء رسولهم﴾ ئینجا هەر کە پەیامبەرەکەیان "لە قیامەتدا" هاتە لایان و، شایەدی لەسەردان ﴿قضی بینهم بالقسط﴾

ئیتر بەداد گەرانە داوەری دەکرێ لەنێوانیاندا ﴿وهم لا یظلمون﴾ وهیچ ستەمیشیان لێناکرێ" واتە: بێ تاوان و گوناح سزای هیچ کەسێك نادرێ.

**بێ باوەڕانی قیامەت بە پەلەن بۆ هاتنی:**

﴿[48] ویقولون متى هذا الوعد إن كنتم صادقين﴾ بێ باوەڕەکان دەڵێن: باشە ! ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن قیامەت دێت، ئەم بەڵێنی هەڕەشەیە کەی جێبەجێ دەبێت؟ ﴿[49] قل لا أملك لنفسى ضرا ولا نفعا﴾ لە وەڵامدا بڵێ: خۆمن لە زیان و لەسوودی خۆیشم هیچ نازانم و، دەسەڵاتێکم نییە" ﴿إلا ماشاء الله﴾ مەگەر ئەوەی خوا خۆی مەیل و ویستی لەسەر بێ ، دەسا ئیتر من چۆن دەزانم ئەو ڕۆژە کەی دێت ؟ ﴿لكل امة اجل﴾ بۆ هەموو ئومەت و نەتەوەیەك ، لای خوا ماوەو کاتێك هەیە بۆ لەناوبردنی ﴿إذا جاء أجلهم﴾ جاهەر کە ئاکامیان هات ﴿فلا يستأخرون ساعة﴾ ئیتر ناتوانن تەنها دەم و ساتێك دوا بکەون ﴿ولا يستقدمون﴾ و پێشیش ناکەون لەو ماوەیە بۆیان دیاریکراوە ﴿[50] قل أرايتم إن أتاكم عذابه﴾ ئەی پێغەمبەر! بڵێ: ئاخۆ ئەر سزای خواتان بۆبێت ﴿بياتا أو نهارا﴾ بە شەو، یان بە ڕۆژ، خۆ ناتوانن لەخۆتانی دووربخەنەوە ﴿ماذا يستعجل منه المجرمون﴾ دەسا ئیتر چ پەلەیەکی بۆ دەکەن ئەو تاوانبارانە؟ ﴿[51] أثم إذا ما وقع آمنتم به آلآن﴾ ئاخۆ پاش ئەوە کە سزاکە هات بۆتان باوەڕتان هێنا بەخوا ، دەبێ باوەڕی وا چ کەڵکێکی هەبێت بۆتان، بۆیە دەگوترێت :ئەوە ئێستا باوەڕ دێنن ؟ ﴿وقد كنتم به تستعجلون﴾ لە کاتێکا بەر لە هاتنەکەی، ئێوە-بەگاڵتەوە- پەلەتان بۆ دەکردو، باوەڕتان پێ نەدەکرد! ﴿[52] ثم قيل للذين ظلموا﴾ لە پاشان بەو کەسانە کە ستەمیان کردووە دەگوترێت: ﴿ذوقوا عذاب الخلد﴾ دەسا سزای هەتا هەتایی بچێژن ﴿هل تجزون إلا بما كنتم تكسبون﴾ ئاخۆ بەدەر لەوە خۆتان کردووتانە، جەزرەبەو تۆڵە دەدرێن ؟ دڵنیابن چیتان کردووە، هەر بەوەش تۆڵە دەدرێن .

الجزء الحادي عشر — سورة يونس

وَلَوْ أَنَّ لِكُلِّ نَفْسٍ ظَلَمَتْ مَا فِي ٱلْأَرْضِ لَٱفْتَدَتْ بِهِۦ ۗ وَأَسَرُّوا۟
ٱلنَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ۖ وَقُضِىَ بَيْنَهُم بِٱلْقِسْطِ ۚ وَهُمْ
لَا يُظْلَمُونَ ﴿٥٤﴾ أَلَآ إِنَّ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ أَلَآ إِنَّ
وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٥﴾ هُوَ يُحْىِۦ وَيُمِيتُ
وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٥٦﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَتْكُم مَّوْعِظَةٌ
مِّن رَّبِّكُمْ وَشِفَآءٌ لِّمَا فِي ٱلصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ
﴿٥٧﴾ قُلْ بِفَضْلِ ٱللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُوا۟ هُوَ خَيْرٌ مِّمَّا
يَجْمَعُونَ ﴿٥٨﴾ قُلْ أَرَءَيْتُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ لَكُم مِّن رِّزْقٍ
فَجَعَلْتُم مِّنْهُ حَرَامًا وَحَلَٰلًا قُلْ ءَآللَّهُ أَذِنَ لَكُمْ ۖ أَمْ عَلَى ٱللَّهِ
تَفْتَرُونَ ﴿٥٩﴾ وَمَا ظَنُّ ٱلَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ
يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ
لَا يَشْكُرُونَ ﴿٦٠﴾ وَمَا تَكُونُ فِي شَأْنٍ وَمَا تَتْلُوا۟ مِنْهُ مِن قُرْءَانٍ
وَلَا تَعْمَلُونَ مِنْ عَمَلٍ إِلَّا كُنَّا عَلَيْكُمْ شُهُودًا إِذْ تُفِيضُونَ
فِيهِ ۚ وَمَا يَعْزُبُ عَن رَّبِّكَ مِن مِّثْقَالِ ذَرَّةٍ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا فِي
ٱلسَّمَآءِ وَلَآ أَصْغَرَ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْبَرَ إِلَّا فِي كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ﴿٦١﴾

٢١٥

**قیامەت ڕاستەو دروست:**

﴿[53] ويستنبؤنك احق هو﴾ بێ باوەڕەکان دەپرسن: ئایا ئەوی هەواڵت پێداین لە سزا ڕاستەودێتە دی؟ ﴿قل إى وربى إنه لحق﴾ پێیان بڵێ: بەڵێ ڕاستەو پەیدا دەبێت سوێند بە پەروەردگارم ﴿وما انتم بمعجزين﴾ و ئێوەیش ناتوانن خوا دەستەوسان بکەن و، لەدەستی ڕابکەن و خۆقوتار بکەن ﴿[54] ولو أن لكل نفس ظلمت ما فى الأرض﴾ و ئەر هەرچی لە زەوییدایە هی تەنها کەسێکی موشریك و ستەمکار بێت ﴿لافتدت به﴾ لەڕۆژی قیامەتدا بریتی خۆی پێ دەدات بۆ ڕزگار بوونی لە سزا ﴿واسروا الندامة لما راوا العذاب﴾ وە ئەوکاتە کەبەچاو سزاکە دەبینن، ئەوان پەشیمان دەبنەوە، بەڵام لەبەر خەجاڵەتی خۆیان دەری نابڕن و دەیشارنەوە ﴿وقضى بينهم بالقسط﴾ و لە

نێوانیاندا بەدادگەرانە داوەریی دەکریٚ ﴿وهم لا یظلمون﴾ و هیچ ستەمیشیان لیٚ ناکریٚ ﴿٥٥ الا إن لله مافی السموات والأرض﴾ ئاگادار بن! بەڕاستیی هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوییدایە هەر بۆ خوایە ﴿الا إن وعد الله حق﴾ بێداربن وچاك بزانن ! کە بەڵێنی خوا -بەهاتنی ڕۆژی قیامەت و ،پاداش و تۆڵە- ڕاست و ڕەوایە ﴿ولکن اکثرهم لا یعلمون﴾ بەلاٚم زۆربەی ئەوانە نازانن ئەوڕۆژە چ ڕۆژێکە، بۆیە وا بیٚ ئاگان و ململانیٚ ئەکەن ﴿٥٦ هو یحیی ویمیت﴾ تەنها ئەوە ژین دەداو، هەرخۆشیەتی دەمرێنیٚ و گیان دەباتەوە ﴿والیه ترجعون﴾ هەر بۆلای ئەویش دەگەڕێنرێنەوە، جا ئەوکاتە بەڵێنەکانی خوا بەچاوی خۆتان دەبینن و، پاداشیش وەردەگرن.

**قورئان پەندوشفاو ڕێنمایی وبەزەیی خوایە بۆ مرۆڤەکان:**

﴿٥٧ یا ایها الناس قد جاءتکم موعظة من ربکم﴾ ئەی خەڵکینە! بێگومان پەندو ئامۆژگارییەکی گەورەو مەزنتان - واتە: قورئانی پیرۆز- لای پەروەردگارتانەوە بۆ هات ، سزای خواتان وەبیردەخاتەوە ﴿وشفاء لما فی الصدور﴾ و شفاو دەرمانیشە بۆ ئەو گومان و نەفامییەی لە سینگدایە ﴿وهدی ورحمة للمؤمنین﴾ و ڕێنمایی و ڕەحمەت و بەزەییشە بۆ گشت باوەڕداران، لەچەند جێیەکی تریشدا ئەم شفای قورئانە بۆ دڵ و دەروونی ئیمانداران دووپات کراوەتەوە، بۆنموونە: لەئایەتی(٨٢ /ئیسرا)دا دەفەرمویٚ: (وننزل من القرآن ماهو شفاء ورحمة للمئومنین...) وە دەفەرمویٚ: (قل هوللذین آمنوا هدی وشفاء...) ﴿٥٨ قل بفضل الله وبرحمته﴾ بڵیٚ: دەبیٚ تەنها بە بەهرەو میهرەبانی خوا- واتە: بە قورئان و ئیسلامی پیرۆز- ﴿فبذلك فلیفرحوا﴾ خۆشحاڵ و دڵشاد بن، چونکە سەرفەرازیی هەردوو جیهانەکەن ﴿هو خیر مما یجمعون﴾ ئەوەش لەوهەموو دەسکەوتە ئەوان کۆی دەکەنەوە باشترە.

**بیٚ لەخوا مافی حەلاڵ و حەرامکردن بۆکەس نیە:**

﴿٥٩ قل ارأیتم ما انزل الله لکم من رزق﴾ بڵیٚ: ئاخۆ ئەو ڕزق و ڕۆزییە کە خوا دایبەزاندووە بۆتان ﴿فجعلتم منه حراما وحلالا﴾ ئەوجا ئێوەیش بەئارەزووی خۆتان بەشێکی قەدەغەو حەرام دەکەن و، بەشێکیشی حەلاڵ ؟! ﴿قل آالله اذن لکم﴾ بڵیٚ: ئاخۆ خوا ئیزنی داون ئاوا بکەن ؟ ﴿ام علی الله تفترون﴾ نەخێر ، بۆخۆتان درۆ لەسەرخوا هەڵدەبەسن ! ﴿٦٠ وماظن الذین یفترون علی الله الکذب یوم القیامة﴾ و دەبیٚ بۆچوونی ئەوانە وا درۆ لەسەر خوا هەڵدەبەسن - لە بابەت تۆڵەی ڕۆژی قیامەتەوە- چۆن بیٚ ؟ تۆ بڵێیت وابزانن خوا چاوپۆشییان لێدەکات ؟ ﴿إن الله لذو فضل علی الناس﴾ بێگومان خوا بەرامبەر بەهەموو کەسیٚ خاوەنی بەهرەی مەزن و گەورەیە، بۆیە زوو سزایان نادات تاشوکری بکەن ﴿ولکن اکثرهم لایشکرون﴾ بەلاٚم زۆربەیان لەبەرامبەر ئەو گشت نیعمەتانەوە ناسوپاس و سوپڵەن و پێنازانن!

**وردو درشت (گەورەو بچووك) لای خوا چوون یەکە:**

﴿٦١ وما تکون فی شأن﴾ وە تۆ لەهیچ کارێکدا نابی ﴿وما تتلوا منه من قرآن﴾ و هیچ شتیٚ لەقورئانیان بەسەرا ناخوێنیت ﴿ولا تعملون من عمل﴾ و ئێوەش ئەی مرۆڤ ! هیچ کاریٚ ئەنجام نادەن ﴿إلا کنا علیکم شهودا﴾ مەگەر ئێمە بەسەرتانەوە ئاگادارین, واتە:هەر شتێك دەکەن و، بەهەر جۆریٚ دەیکەن ، ئێمە لێی بەئاگاین ﴿إذ تفیضون فیه﴾ هەر ئەوکاتە دەست بەکارەکەتان دەکەن و بۆی ڕۆدەچن ﴿وما یعزب عن ربك مثقال ذرة فی الأرض ولا فی السماء﴾ وەبەئەندازەی تۆز قاڵێکیش، نە لەزەویی، نە لەئاسمان، شتیٚ لە پەروەردگارت ون نابێت ﴿ولا أصغر من ذلك ولا اکبر﴾ و نەبچووکتر لەوەو، نە گەورەتریش لەو ﴿إلا فی کتاب مبین﴾ هیچ شتیٚ لەوانە لە ئێمە نادیارو بزر نیەو، هەموویشی لە نامەیەکی ئاشکرادا وەك (لوح المحفوظ) تۆمارکراوە.

## ئەولیای خوا بناسە!:

﴿<sup></sup>٦٢ الا إن اولياء الله لا خوف عليهم﴾ چاك بزانن و هۆشیاربن ! كە دۆستەكانی خوا – دوا رۆژ– هچ ترس و بیمێكیان لەسەرنیە ﴿ولا هم يحزنون﴾ و دڵ زویرو خەفەتباریش نابن بۆ دونیای پاش خۆیان ﴿٦٣ الذين آمنوا وكانوا يتقون﴾ دۆستی خوا ئەوانەن كە: باوەڕی كامڵیان هێناوەو، هەمیشەش لە خوا دەترسن و، خۆدەپارێزن لە هەر شتێ: پێویستە خۆپارێزی لێبكەن ، بەردەوامیش بە پێی فەرمانی خواو پەیامبەر ﷺ كاردەكەن. تەفسیرەكان چەندە بەجوانی پێناسەی پیاوانی خواو(ئەولیاء)كان دەكەن و دەڵێن: (الولی: هو المؤمن التقی) واتە: وەلیی: ئەو مرۆڤە خاوەن ئیمان و خواترسەیە كە: هەمیشە خوای لەیادە، لەفەرموودەیەكیشدا هاتووە: ((إن لله عبادا ماهم بأنبياء، ولا شهداء، يغبطهم الأنبياء والشهداء يوم القيامة لمكانتهم من الله، قالوا أخبرنا من هم. فلعلنا نحبهم، قال: هم قوم تحابوا فی الله، علی غير أرحام بينهم ولا أموال يتعاطونها، فوالله إن وجوههم لنور، وأنهم لعلی منابر من نور، لا يخافون إذا خاف الناس، ولا يحزنون إذا حزن الناس، ثم قرأ)الا إن أولياء الله..) سنن أبی داود. واتە: بەراستیی خوای گەورە تاقمێ بەندەی هەن، نە پێغەمبەرن، نە شەهید، كەچی ئەوەندە پلەیان بەرزە لەرۆژی قیامەتدا پێغەمبەران و شەهیدان خۆزگەیان لێ دەخوازن! گوتیان: بابزانین كێن، تا خۆشمان بوێن، فەرمووی: ئەوكەسانەن كە: بێ تەماح و، بێ خزمایەتی یەكتریان خۆش دەوێ! سوێند بەخوا روخساریان پڕ لەنوورەو، لەسەر میمبەری نووریشن چاك بزانن! ئەو دەم خەڵكی دەترسێ و خەفەتبارە ئەوان هیچ ترس و خەفەتێكیان نییە، پاشان ئەم ئایەتەی: (الا ان أولياءالله..)ـی خوێندەوە. ﴿٦٤ لهم البشری فی الحياة الدنيا وفی الآخرة﴾ لەم ژیانی دونیاو، لەو رۆژەكەی تریشدا موژدەی سەرفرازیی و، بەختیاریی وەردەگرن ، لە دونیادا خەونی خۆش و باش دەبینن، لە قیامەتیشدا بەهرەكانی بەهەشت وەدەست دەخەن ﴿لا تبديل لكلمات الله﴾ بەڵێن و فەرمانی خوا هەرگیز گۆڕانیان بەسەر نایەت ﴿ذلك هو الفوز العظيم﴾ تەنها ئەوەدەسكەوتەیە ڕزگاریی و سەرفرازیی گەورەو مەزن.

سُورَةُ يُونُس — الجزء الحادي عشر

أَلَآ إِنَّ أَوۡلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ٦٢ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ٦٣ لَهُمُ ٱلۡبُشۡرَىٰ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِۚ لَا تَبۡدِيلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ٦٤ وَلَا يَحۡزُنكَ قَوۡلُهُمۡۘ إِنَّ ٱلۡعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًاۚ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ٦٥ أَلَآ إِنَّ لِلَّهِ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَمَا يَتَّبِعُ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ شُرَكَآءَۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنۡ هُمۡ إِلَّا يَخۡرُصُونَ ٦٦ هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيۡلَ لِتَسۡكُنُواْ فِيهِ وَٱلنَّهَارَ مُبۡصِرًاۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَسۡمَعُونَ ٦٧ قَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدٗاۗ سُبۡحَٰنَهُۥۖ هُوَ ٱلۡغَنِيُّۖ لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ إِنۡ عِندَكُم مِّن سُلۡطَٰنِۭ بِهَٰذَآۚ أَتَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٦٨ قُلۡ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ لَا يُفۡلِحُونَ ٦٩ مَتَٰعٞ فِي ٱلدُّنۡيَا ثُمَّ إِلَيۡنَا مَرۡجِعُهُمۡ ثُمَّ نُذِيقُهُمُ ٱلۡعَذَابَ ٱلشَّدِيدَ بِمَا كَانُواْ يَكۡفُرُونَ ٧٠

٢١٦ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ

## دەسەڵات هەر هی خوایە:

﴿٦٥ ولا يحزنك قولهم﴾ نابێ بەقسەی نارەوای كافران و موشریكان، خەفەتبارو دڵزویر ببیت ﴿إن العزة لله جميعا﴾ چونكە بەڕاستیی عیززەت و هێزو دەسەڵاتی كامڵ هەر بۆ خوایە، واتە: دەتوانێ تۆڵە لە ستەمكاران و بێ باوەڕان بسێنێ ﴿وهو السميع العليم﴾ و هەر ئەویشە بیسندەی ڕاستەقینەو زاناو دانای كامڵ ﴿٦٦ الا إن لله من فی السموات ومن فی الأرض﴾ بابزانن ! كە بێگومان هەرچی لە ئاسمانەكان و، لە زەوییدایە هەر بۆ خوایەو ئەو خۆی خاوەنیەتیی و، چی ویست بۆ خۆی بڕیاری لەسەر دەدات، ئیتر ئەو بتانە چۆن دەبنە خوا ؟!﴿وما يتبع الذين

یدعون من دون الله شرکاء﴾ ئەوانەی بەدەر لەخوا دەپەرستن, لە هەقیقەتدا شوێنی هیچ شەریك و هاوبەشێك بۆ خوا ناکەون ﴿إن یتبعون إلا الظن﴾ هەر وەدووی گومان دەکەون ﴿وإن هم إلا یخرصون﴾ و هیچ بەڵگەیەکیان نییە, جگە لە گۆترە کاریی و درۆو دەلەسە ، کە ئەمەیش بۆخۆی هیچ کەڵك و سودێکی نییە بۆیان
﴿٦٧ هو الذی جعل لکم اللیل﴾ خوا هەر ئەوەیە کە شەوی بۆ بەدی هێناون ﴿لتسکنوا فیه﴾ بۆ ئەوەی ئارامی تێدا بگرن وتیابحەوێنەوە ﴿والنهار مبصرا﴾ و ڕۆژیش بە ڕۆشن, هەتا ڕێ بە پێویستیەکانی خۆتان ببەن ﴿إن فی ذلك لآیات﴾ بە ڕاستیی لە دروستکردنی و هێنانی شەوو ڕۆژدا، چەندین ئایەت و نیشانە هەیە لەسەر تاقانەیی خوا ﴿لقوم یسمعون﴾ بۆ ئەو کەسانە کە بەڵگە دەبیسن و تێدەفکرێن.

## خوا ژن و منداڵ و شەریکی نیە :

﴿٦٨ قالوا اتخذ الله ولدا﴾ هاوبەشدانەرەکان وتیان: خوا زاڕۆڵەو منالّی بۆ خۆی داناوە، گوایە دەڵێن: فریشتە کچانی خوان !! ﴿سبحانه هو الغنی﴾ خوا لەو تۆمەتانە پاك و خاوێن و بێخەوشە، بۆخۆیشی زۆر بەرزو بێ نیازە لەهەمووشتێك ﴿له مافی السموات وما فی الأرض﴾ هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوییدایە، موڵکی ئەوە، ئیتر ئەو چ نیازێکی بەمناڵ هەیە ! ﴿إن عندکم من سلطان بهذا﴾ هیچ بەڵگەیەکتان نی یە کە: خوا منالّی هەبێ ﴿اتقولون علی الله ما لا تعلمون﴾ ئایا بەرامبەر بەخوا شتێ دەڵێن هیچی لێنازانن؟
﴿٦٩ قل إن الذین یفترون علی الله الکذب﴾ بڵێ: ئەو کەسانەی کەدرۆ بۆ خوا هەڵدەبەسن (ئەڵێن منداڵی هەیە) ﴿لا یفلحون﴾ قەت ڕزگارو بەختیار نابن
﴿٧٠ متاع فی الدنیا﴾ لەدنیادا کەمێ خۆشی و لەزەت دەبەن ﴿ثم إلینا مرجعهم﴾ بۆ دوایی تەنها بۆلای خۆمان دەگەڕێنەوە ﴿ثم نذیقهم العذاب الشدید﴾ لە پاشا سزای توندیان پێدەچێژین ﴿بما کانوا یکفرون﴾ لەبەر کوفرو بێ باوەڕییان.

الجزء الحادي عشر — سورة يونس — الحزب ٢٢

وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ نُوحٍ إِذۡ قَالَ لِقَوۡمِهِۦ يَٰقَوۡمِ إِن كَانَ كَبُرَ عَلَيۡكُم
مَّقَامِي وَتَذۡكِيرِي بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَعَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلۡتُ فَأَجۡمِعُوٓاْ
أَمۡرَكُمۡ وَشُرَكَآءَكُمۡ ثُمَّ لَا يَكُنۡ أَمۡرُكُمۡ عَلَيۡكُمۡ غُمَّةٗ ثُمَّ ٱقۡضُوٓاْ
إِلَيَّ وَلَا تُنظِرُونِ ٧١ فَإِن تَوَلَّيۡتُمۡ فَمَا سَأَلۡتُكُم مِّنۡ أَجۡرٍۖ إِنۡ
أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِۖ وَأُمِرۡتُ أَنۡ أَكُونَ مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ٧٢
فَكَذَّبُوهُ فَنَجَّيۡنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ فِي ٱلۡفُلۡكِ وَجَعَلۡنَٰهُمۡ خَلَٰٓئِفَ
وَأَغۡرَقۡنَا ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَاۖ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُنذَرِينَ
٧٣ ثُمَّ بَعَثۡنَا مِنۢ بَعۡدِهِۦ رُسُلًا إِلَىٰ قَوۡمِهِمۡ فَجَآءُوهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ
فَمَا كَانُواْ لِيُؤۡمِنُواْ بِمَا كَذَّبُواْ بِهِۦ مِن قَبۡلُۚ كَذَٰلِكَ نَطۡبَعُ عَلَىٰ قُلُوبِ
ٱلۡمُعۡتَدِينَ ٧٤ ثُمَّ بَعَثۡنَا مِنۢ بَعۡدِهِم مُّوسَىٰ وَهَٰرُونَ إِلَىٰ
فِرۡعَوۡنَ وَمَلَإِيْهِۦ بِـَٔايَٰتِنَا فَٱسۡتَكۡبَرُواْ وَكَانُواْ قَوۡمٗا مُّجۡرِمِينَ ٧٥
فَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلۡحَقُّ مِنۡ عِندِنَا قَالُوٓاْ إِنَّ هَٰذَا لَسِحۡرٞ مُّبِينٞ ٧٦
قَالَ مُوسَىٰٓ أَتَقُولُونَ لِلۡحَقِّ لَمَّا جَآءَكُمۡۖ أَسِحۡرٌ هَٰذَا وَلَا يُفۡلِحُ
ٱلسَّٰحِرُونَ ٧٧ قَالُوٓاْ أَجِئۡتَنَا لِتَلۡفِتَنَا عَمَّا وَجَدۡنَا عَلَيۡهِ ءَابَآءَنَا
وَتَكُونَ لَكُمَا ٱلۡكِبۡرِيَآءُ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا نَحۡنُ لَكُمَا بِمُؤۡمِنِينَ ٧٨

٢١٧

## داستانی نووح و نەتەوەکەی:

﴿٧١ واتل علیهم نبأ نوح﴾ تۆ ئەی پێغەمبەر! ﷺ هەواڵ و بەسەرهاتی نووح (پەیامبەر) یان بۆ بخوێنەوە ﴿إذ قال لقومه﴾ ئەوحەلە کە: بە هۆزو گەلەکەی خۆیگوت: ﴿یا قوم إن کان کبر علیکم مقامی وتذکیری بآیات الله﴾ ئەی هۆزی من ! ئەر بەبوونم لەناوتاندا قەڵس و نارەحەتن و، ئامۆژگاریشم بە ئایەتەکانی خوا لاتان گران دەبێ و پێتان ناخۆش دەبێت ﴿فعلی الله توکلت﴾ دەسا چاك بزانن کە: من هەر بەخوای خۆم پشت دەبەستم و، ئێوەیش چی ئەکەن بیکەن گوێم لێ نییە ﴿فأجمعوا أمرکم وشرکاءکم﴾ ئەوسا ئێوەو گشت پەرستراوەکانتان قسەتان یەکبخەن و هاواریان بۆبەرن، با یارمەتیتان بدەن بۆ دژایەتی و بەربەرەکانێی من ﴿ثم لا یکن أمرکم علیکم غمة﴾ پاشان باکارو بڕیارتان ، ئاشکراو ڕوون بێ و، دوودڵی تێدا نەبێ، واتە: بە ئاشکرا سەرجەم دوژمنایەتیم بکەن! ﴿ثم اقضوا إلي

﴿ولا تنظرون﴾ پاشان گشت پەلامارم بدەن و، هیچیش مۆڵەتم مەدەن ، دیارە ئەمە ئەوپەڕ متمانەیە بەخوای گەورە کەپشتیوانیەتی ﴿٧٢ فإن توليتم فما سألتكم من اجر﴾ خۆ ئەگەر لە ئامۆژگارییەکانیشم ڕوو وەرگێڕن، لەبەر ئەوە نییە کەمن داوای کرێیەکم لێکردبن, بەڵکو هەر لەبەر لاساریی و بەدبەختیی خۆتانە ﴿إن أجري إلا على الله﴾ چونکە مزەو پاداشی من هەرلای خوایە ﴿وامرت أن اكون من المسلمين﴾ و فەرمانم پێکراوە کە لەموسڵمانان بم ﴿٧٣ فكذبوه﴾ کە چی (نووح)یان بەدرۆزن داناو باوەڕیان پێنە هێنا! ﴿فنجيناه ومن معه في الفلك﴾ ئەوجا ئێمەیش خۆیی و ئەوخەڵکە باوەڕیان هێنابوو و لە گەڵیبوون لەکەشتییەکەدا، ڕزگارمانکردن ﴿وجعلناهم خلائف﴾ و کردماننە جێنشینی خەڵکە کافرە خنکاوەکان ﴿واغرقنا الذين كذبوا بآياتنا﴾ و ئەوانەش وا بڕوایان بە ئایەت و بەڵگەکانی ئێمە نەبوو و بەدرۆیان خستنەوە، گشتمان نقومکردن بە تۆفان! ﴿فانظر كيف كان عاقبة المنذرين﴾ جا بنواڕەو بزانە پاشە ڕۆژی ترسێنراوەکان (ئەوانەی پێغەمبەران ترساندنیان و کەڵکیان لێ وەرنەگرت)چۆن بوو ؟﴿٧٤ ثم بعثنا من بعده رسلا إلى قومهم﴾ پاشان لەدوای (نووح)یشەوە چەند پەیامبەرێکمان نارد (وەکو هودو، صالح و...) هەریەکە بۆلای هۆزی خۆی ﴿فجاؤهم بالبينات﴾ جا بەچەند بەڵگەو نیشانەیەکی زۆرەوە چوونە لایان کە: بڕوایان پێ بهێنن ﴿فما كانوا ليؤمنوا بما كذبوا به من قبل﴾ کەچی ئەمانیش باوەڕیان بەوشتانە نەکرد کە: لەبەرا هۆزەکەی نووحیش بەدرۆیان زانی! ﴿كذلك نطبع على قلوب المعتدين﴾ ئێمە هەر ئاوا مۆرمان نا بەسەر دڵی ئەوانەدا ، مۆر دەنێین بەسەر دڵی گشت دەست درێژکاراندا، واتە: ئەوانەی حاشا لەدینی خوا دەکەن.

## مووساو فیرعەون:

﴿٧٥ ثم بعثنا من بعدهم موسى و هارون إلى فرعون وملإئه بآياتنا﴾ ئەمجار لەپاش ئەو (پێغەمەران و ئوممەتان)ـەیشەوە (موسا)و (هاروون)مان بە نیشانەو ئایەتەکانی خۆمانەوە ناردە لای فیرعەون و ناودارانی گەلەکەی بۆهیدایەت و ڕێنماییان ﴿فاستكبروا وكانوا قوما مجرمين﴾ جا خۆیان لە بەرامبەر ئەوراستییەوە بەگەورە زانی و، هەرموشریك و تاوانبار بوون ﴿٧٦ فلما جاءهم الحق من عندنا﴾ کە هەق و ڕاستیی ئێمەیان بۆهات ﴿قالوا إن هذا لسحر مبين﴾ وتیان: بێگومان ئەمە موسا هێناویەتی جادوویەکی ئاشکرایە، دیارە مەبەستیان دەست و عەسایەکەی مووسابوو!! ﴿٧٧ قال موسى اتقولون للحق لما جاءكم أسحر هذا﴾ موسا وتی: چۆن بەو هەق و ڕاستییە کەهاتە لاتان دەڵێن: ئەمە جادووە، جائەگەر من جادووگەربم؟! ﴿ولا يفلح الساحرون﴾ خۆ جادووگەران قەت سەرکەوت و سەرفراز نابن ؟ ﴿٧٨ قالوا اجئتنا لتلفتنا عما وجدنا عليه آباءنا﴾ وتیان: ئایا بۆ ئەوە هاتویتە لامان کەئێمە لەو ئایینەی باووباپیرانمان لەسەریبوون وەرمان گێڕیی و لامان بدەی ﴿وتكون لكما الكبرياء في الأرض﴾ وئاغایەتیی و میرایەتی وڵاتی (میسر) بۆ ئێوە بێ ؟﴿وما نحن لكما بمؤمنين﴾ دەسا ئێمە بەهیچ شێوەیەك باوەڕ ناکەین ئێوە پێغەمبەر بن.

## مووساو جادو گەرەکان:

﴿٧٩ وقال فرعون ائتوني بكل ساحر عليم﴾ ئەوسا فیرعەون کە عەساو دەسە سپیەکەی موسای دی وتی: بچن هەرچی جادووگەری فرەزان و شارەزایە بیهێنن بۆم ﴿٨٠ فلما جاء السحرة﴾ جا کە جادووگەرەکان هاتن ﴿قال لهم موسى﴾ موسا پێیگوتن: ﴿ألقوا ماانتم ملقون﴾ ئەوی کە دەیهاوێژن ، دەسا بیهاوێژن ﴿٨١ فلما القوا﴾ ئینجا ئەوی کە مەبەستیان بوو بیهاوێژن، هاویشتیان ﴿قال موسى ماجئتم به السحر﴾ موسا وتی: دڵنیابن هەرچیتان هێنا جادووبوو ﴿إن الله سيبطله﴾ بیشزانن کە بەڕاستی خوا بەزوویی باتڵ و پووچەڵی دەکات ﴿إن الله لايصلح عمل

﴿المفسدين﴾ چونکه هەرگیز خوا کاروکردەوەی خراپەکاران ڕاست ناهێنێ و بە ئەنجامی ناگەیەنێ ﴿٨٢ ويحق الله
الحق بكلماته﴾ و خوای گەورە بەقسەو بە بەڵگەکانی خۆی هەمیشە هەق و ڕاستیی سەردەخات ﴿ولو كره
المجرمون﴾ ئەگەر چی تاوانبارانیش پێیان ناخۆش بێت ﴿٨٣ فما آمن لموسى إلا ذرية من قومه﴾ جا لەسەرەتاوە
چەند تازە لاوێکی هۆزەکەی نەبێ بڕوایان بەمووسا نەهێنا ﴿على خوف من فرعون وملإئهم﴾ لەترسی فیرعەون و
پیاوەگەورەکانیان ﴿أن يفتنهم﴾ کە سزایان بدەن و لەو ئایینە بەزۆر وەریان گێڕن ﴿وإن فرعون لعال في الأرض﴾
بێگومان فیرعەون لەو وڵاتەدا پیاوێکی خۆ بەزلزان و دەسەڵاتدارو ﴿وإنه لمن المسرفين﴾ و یەکێ بوو لەسنوور
دەرچووان و سەرلێشێواوان ، بۆیە داوای خوایەتی دەکرد!

**مووسا هانی قەومەکەی دەدا پشت ببەستن بەخوا:**

﴿٨٤ وقال موسى يا قوم﴾ موسا وتی: ئەی گەلەکەم !
﴿إن كنتم آمنتم بالله﴾ ئەگەر بەڕاستی ئێوە باوەڕتان بەخوا
هێناوە ﴿فعليه توكلوا﴾ جا دەبێ تەنها پشت بەو ببەستن
﴿إن كنتم مسلمين﴾ ئەگەر موسڵمان و ملکەچی فەرمانی
ئەوبوون ﴿٨٥ فقالوا على الله توكلنا﴾ جائەوانیش وتیان:
ئێمە تەنها بەخوا پشت ئەستوورین و، کاری خۆمان دایە
لای ئەو ﴿ربنا لا تجعلنا فتنة للقوم الظالمين﴾ ئەی
پەروەردگاری ئێمە! مەمانخەرە بەرفیتنەو تاقیکردنەوە
لەبەر دەستی هۆزو گەلی ستەمکاراندا، تا زاڵ نەبن
بەسەرماندا، لەدین وەرمان نەگێڕن ﴿٨٦ ونجنا برحمتك من
القوم الكافرين﴾ و بە میهرەبانی خۆیشت لەدەست هۆزی بێ
بڕوایان – فیرعەون وتاقمەکەی ئەو– ڕزگارمان بکە ﴿٨٧
وأوحينا إلى موسى وأخيه﴾ و سروشمان بە (موسا)و
(هاروون)ی برای کرد ﴿أن تبوءا لقومكما بمصر بيوتا﴾ کە
بۆ قەوم و هۆزەکەی خۆتان لە (میسر)دا چەند ماڵێ بکەنە
ئەنواو پەرستگا، (ئیبن عەبباس) ئەڵێ: زۆر لە فیرعەون و لە
دام و دەزگای ئەودەترسان کە: جەزرەبەو ئازاریان بدەن، بۆیە فەرمانیان پێکرا کە لەماڵەوە خوا پەرستیی خۆیان
بکەن و، نەچنە کەنیسەکان ﴿واجعلوا بيوتكم قبلة﴾ وەماڵەکانتان بکەنە قیبلەو ڕووگەتان ﴿وأقيموا الصلاة﴾ و
لەوێ بە تێرو تەسەلیی نوێژ بکەن ﴿وبشر المؤمنين﴾ و بە باوەڕدارانیش مژدە بدە کە: خوای گەورە
بەسەرستەمکاراندا سەریان دەخات.

الجزء الحادي عشر — سُورَةُ يُونُس

وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ ٱئۡتُونِي بِكُلِّ سَٰحِرٍ عَلِيمٖ ٧٩ فَلَمَّا جَآءَ ٱلسَّحَرَةُ
قَالَ لَهُم مُّوسَىٰٓ أَلۡقُواْ مَآ أَنتُم مُّلۡقُونَ ٨٠ فَلَمَّآ أَلۡقَوۡاْ قَالَ
مُوسَىٰ مَا جِئۡتُم بِهِ ٱلسِّحۡرُۖ إِنَّ ٱللَّهَ سَيُبۡطِلُهُۥٓۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُصۡلِحُ
عَمَلَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ٨١ وَيُحِقُّ ٱللَّهُ ٱلۡحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ
ٱلۡمُجۡرِمُونَ ٨٢ فَمَآ ءَامَنَ لِمُوسَىٰٓ إِلَّا ذُرِّيَّةٞ مِّن قَوۡمِهِۦ عَلَىٰ
خَوۡفٖ مِّن فِرۡعَوۡنَ وَمَلَإِيْهِمۡ أَن يَفۡتِنَهُمۡۚ وَإِنَّ فِرۡعَوۡنَ لَعَالٖ
فِي ٱلۡأَرۡضِ وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ٨٣ وَقَالَ مُوسَىٰ يَٰقَوۡمِ إِن كُنتُمۡ
ءَامَنتُم بِٱللَّهِ فَعَلَيۡهِ تَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّسۡلِمِينَ ٨٤ فَقَالُواْ عَلَى ٱللَّهِ
تَوَكَّلۡنَا رَبَّنَا لَا تَجۡعَلۡنَا فِتۡنَةٗ لِّلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ٨٥ وَنَجِّنَا
بِرَحۡمَتِكَ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٨٦ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰ وَأَخِيهِ
أَن تَبَوَّءَا لِقَوۡمِكُمَا بِمِصۡرَ بُيُوتٗا وَٱجۡعَلُواْ بُيُوتَكُمۡ قِبۡلَةٗ
وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَۗ وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٨٧ وَقَالَ مُوسَىٰ
رَبَّنَآ إِنَّكَ ءَاتَيۡتَ فِرۡعَوۡنَ وَمَلَأَهُۥ زِينَةٗ وَأَمۡوَٰلٗا فِي ٱلۡحَيَوٰةِ
ٱلدُّنۡيَا رَبَّنَا لِيُضِلُّواْ عَن سَبِيلِكَۖ رَبَّنَا ٱطۡمِسۡ عَلَىٰٓ أَمۡوَٰلِهِمۡ
وَٱشۡدُدۡ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ فَلَا يُؤۡمِنُواْ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ ٨٨

٢١٨ — قال قد

**مووسا دۆعا لە فیرعەون و پیاوانی دیوەخانی دەکا:**

﴿٨٨ وقال موسى ربنا﴾ وە موسا وتی: ئەی پەروەردگارمان ! ﴿إنك آتيت فرعون وملأه زينة وأموالا في الحياة
الدنيا﴾ بەڕاستی تۆ خشڵ و سامانی زۆرت لە ژیانی دنیادا بە فیرعەون و دارو دەستەکەیدا ﴿ربنا ليضلوا عن
سبيلك﴾ ئەی پەروەردگارمان ! وائێستا ڕێگای ڕاست بەخۆیشیان و بەنەتەوەکەیشیان چەواشە دەکەن ﴿ربنا اطمس

**علی أموالهم** دەسا ئەی پەروەردگارمان! ماڵ و سامان و داراییەکەیان تەفرو توونا کەو، شوێنەواریان مەهێڵە ﴿**واشدد علی قلوبهم**﴾ دڵ و دەروونیان پتر قورس و رەق و رەشکە، دڵیان مۆرکە ﴿**فلا یؤمنوا حتی یروا العذاب الألیم**﴾ چونکە تاسزای ئێش پێگەیەنەر نەبینن و تووشی نەبن، باوەر ناهێنن ﴿[٨٩] **قال قد أجیبت دعوتکما**﴾ فەرمووی: دڵنیابن وا داواکەتان وەرگیرا ﴿**فاستقیما**﴾ دەسا ئێوەیش لەو مەیدانەدا تابت و دامەزراو بن و، لەسەر کاری خۆتان خۆڕاگرن ﴿**ولا تتبعان سبیل الذین لا یعلمون**﴾ و لە ڕێی ئەوانەوە مەچن نازانن کە هەرەشەی من چەندە سەختە !. (تەبەری) ئەڵێت: پاش چل ساڵ ئینجا ئەم دوعایەیان گیرابوو ﴿[٩٠] **وجاوزنا ببنی إسرائیل البحر**﴾ وەئێمەش وەچەو نەوەی ئیسرائیلمان لە (دەریای سویس)ەوە پەڕاندەوە ﴿**فأتبعهم فرعون وجنوده بغیا وعدوا**﴾ ئینجا فیرعەون و سوپاکەی -بۆ ستەم و دەست درێژیی- شوێنیان کەوتن ﴿**حتی إذا أدرکه الغرق**﴾ تا ئەوساتە خەریك بوو بخنکێ و نوقم ببێ ﴿**قال آمنت انه لا إله إلا الذی آمنت به بنو إسرائیل**﴾ ئەوسا وتی: وابڕوام هێنا: کە بەدەر لەو خوایە نەوەکانی ئیسرائیل بڕوایان پێهێناوە هیچ پەرستراوێکی تر نییە شیاوی پەرستن بێت ﴿**وانا من المسلمین**﴾ وەمن لەو خەڵکە موسڵمان و ملکەچانم کە بۆ خوا ملکەچن.

قَالَ قَدْ أُجِيبَت دَّعْوَتُكُمَا فَاسْتَقِيمَا وَلَا تَتَّبِعَانِّ سَبِيلَ
الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٨٩﴾ ۞ وَجَاوَزْنَا بِبَنِي إِسْرَاءِيلَ الْبَحْرَ
فَأَتْبَعَهُمْ فِرْعَوْنُ وَجُنُودُهُ بَغْيًا وَعَدْوًا حَتَّىٰ إِذَا أَدْرَكَهُ
الْغَرَقُ قَالَ ءَامَنتُ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا الَّذِي ءَامَنَتْ بِهِ بَنُوا إِسْرَاءِيلَ
وَأَنَا مِنَ الْمُسْلِمِينَ ﴿٩٠﴾ ءَالْـَٰٔنَ وَقَدْ عَصَيْتَ قَبْلُ وَكُنتَ
مِنَ الْمُفْسِدِينَ ﴿٩١﴾ فَالْيَوْمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنْ
خَلْفَكَ ءَايَةً وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ النَّاسِ عَنْ ءَايَاتِنَا لَغَافِلُونَ ﴿٩٢﴾
وَلَقَدْ بَوَّأْنَا بَنِي إِسْرَاءِيلَ مُبَوَّأَ صِدْقٍ وَرَزَقْنَاهُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ
فَمَا اخْتَلَفُوا حَتَّىٰ جَاءَهُمُ الْعِلْمُ إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِي بَيْنَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ
فِيمَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿٩٣﴾ فَإِن كُنتَ فِي شَكٍّ مِّمَّا أَنزَلْنَا إِلَيْكَ
فَاسْأَلِ الَّذِينَ يَقْرَءُونَ الْكِتَابَ مِن قَبْلِكَ لَقَدْ جَاءَكَ
الْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ الْمُمْتَرِينَ ﴿٩٤﴾ وَلَا تَكُونَنَّ
مِنَ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِ اللَّهِ فَتَكُونَ مِنَ الْخَاسِرِينَ
﴿٩٥﴾ إِنَّ الَّذِينَ حَقَّتْ عَلَيْهِمْ كَلِمَتُ رَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ
﴿٩٦﴾ وَلَوْ جَاءَتْهُمْ كُلُّ ءَايَةٍ حَتَّىٰ يَرَوُا الْعَذَابَ الْأَلِيمَ ﴿٩٧﴾




**بەنی ئیسرائیل ڕزگار دەبێ و، فیرعەون دەخنکێ:**

﴿[٩١] **ءآلآن وقد عصیت قبل**﴾ بە فیرعەون وترا: ئێستا کە ملکەچ دەبی و باوەڕدێنیت ، خۆ بێگومان تۆ پێشتر سەر پێچیت کرد و یاخی بوویت ﴿**وکنت من المفسدین**﴾ و لەڕیزی خەڵکانی موفسیدو خراپەکاردا بوویت؟! بە یەقین ئەو جۆرە باوەڕهێنانە - لەکات و ساتی وادا- بێ کەڵکەو قەبووڵ نابێت ﴿[٩٢] **فالیوم ننجیك ببدنك**﴾ جاوا ئەمڕۆ لاشەت لە تیاچوون ڕزگار دەکەین و، ناهێڵین لەنێو دەریادا تیا بچێت ، (ئیبن عەباس) دەڵێ: جوولەکە هێمان لە تیاچوونی فیرعەوندا دوودڵبوون ، ئەوسا خوای کارزان فەرمانی دا بەدەریاکە کە: جەستەی بێ گیانی بخاتەوە سەر ئاوەکە هەتا بیناسنەوەو دڵنیابن لەتیاچوونی و بزانن فیرعەون خوا نیە ئەگەرچی خۆیشی داوای خوایەتی دەکرد، پاشان دەریایش فڕێیدایە جێگایەکی دیاریی و بەرزەوە هەتا بەچاو ببینرێ. دووبارە (ئیبن عەباس) ئەڵێ: ئەو ڕۆژە فیرعەون تیاچوو, بەرامبەری /١٠ ی مانگی موحەڕەم بوو، وەکو پێشەوا (بوخاریی) ئەم فەرموودەیەی هێناوەو دەڵێت: (لما قدم النبی ﷺ المدینة، والیهود تصوم یوم عاشوراء ، فقالوا : هذا یوم ظهر فیه موسی علی فرعون، فقال النبی ﷺ لأصحابه: أنتم أحق بموسی منهم ، فصوموه). واتە: ئەو ڕۆژە کەپێغەمبەر ﷺ هاتە مەدینە، دیتی وا جوولەکە لە (١٠)ـی موحەڕەمدا بەڕۆژوون، لەبەر ئەوە کەلەو ڕۆژەدا موسا سەرکەوتووە بەسەر فیرعەوندا، ئینجا پێغەمبەر ﷺ بەهاوەڵانی فەرموو: ئێوە لەوانە بە مووسا هێژاترن , دەسا ئێوەیش لەو ڕۆژەدا بەڕۆژوو بن ﴿**لتکون**

لمن خلفك آية﴾ تا بۆ ئەوانەی دوای تۆ ببێتە پەندو ئامۆژگاری ﴿وإن كثيرا من الناس عن آياتنا لغافلون﴾ چونكە بێگومان زۆربەی خەڵكی لەنیشانەكانی ئێمە بێ ئاگاو خافڵن، بۆیە وا ملی خۆیان دەشكێنن.

**خۆشگوزەرانی بەنی ئیسرائیل:**

﴿٩٣ ولقد بوانا بنی إسرائيل مبوأ صدق﴾ بێگومان دوای ئەوە كە فیرعەونمان لەناو برد ، بەنی ئیسرائیلمان لەجێگەیەكی چاك و شیاو لەوڵاتی (شام و میسر) دامەزراند ﴿ورزقناهم من الطيبات﴾ و ڕۆزی چاك و پاكمان پێدان ﴿فما اختلفوا حتى جاءهم العلم﴾ جا هەتا زانینیان بۆ نەهات دەبارەی هەمووكێشەكانیان بۆ ناسینی هەق و ناهەق جیاوازیان نەبوو، لە فەرمودەیەكدا هاتووە: (إن اليهود اختلفوا على إحدى وسبعين فرقة، وإن النصارى اختلفوا على إثنتين وسبعين فرقة، وستفترق هذه الأمة على ثلاث وسبعين فرقة، منها واحدة في الجنة، وثنتان و سبعون في النار. قيل من هم يارسول الله؟ قال: ما أنا عليه وأصحابي) رواه الحاكم. بێگومان جوولەكە بوونە (٧١) دەستەو بەستە، فەلەكانیش بوونە(٧٢) دەستە، لەئاییندەشدا ئەم ئوممەتی منە دەبێتە (٧٣) بەش، تەنها یەكێكیان بەهەشتییە، (٧٢)كەی تری دۆزەخین، لێیان پرسی: دەبێ ئەو یەكە بەهەشتییە كامانە بن؟ فەرمووی: ئەوانەن ئەو ڕێبازە دەگرن من و هاوەڵانمی لەسەرە. ﴿إن ربك يقضي بينهم يوم القيامة﴾ بەڕاستیی پەروەردگاری تۆ لە ڕۆژی قیامەتدا لەنێوانیاندا بڕیار دەدا ﴿فيما كانوا فيه يختلفون﴾ سەبارەت بەوەی لە دونیادا تێیدا ناكۆك بوون، واتە: لەبارەی پەیامبەرەوە ﷺ داوەری خۆی دەكاو تۆڵەش دەسێنێ.

**كتێبە پێشووەكانیش ئەرێ بۆ قورئان دەكەن:**

﴿٩٤ فإن كنت فی شك مما انزلنا إليك﴾ جائەگەر گومانێكت هەبێ لەوەدا بۆمان دابەزاندوویت ئەی پێغەمبەرﷺ ﴿فاسأل الذين يقرأون الكتاب من قبلك﴾ دەبچۆ لەو پیاوچاكانە لەپێش تۆوە كتێب و نامەی (تەورات و ئینجیل)یان ئەخوێند پرسیار بكە، دیارە خۆ بەدینی خۆیان موسڵمان بوونە، وەك عەبدوڵڵای كوڕی سەلام ﴿لقد جاءك الحق من ربك﴾ بێگومان لە لایەن پەروەردگارتەوە هەقت بۆ هاتووەو گومانی تێدا نیە ﴿فلا تكونن من الممترين﴾ جا كەواتە لەو خەڵكە دوودڵ و بەگومانە مەبە. (قەتادە) ئەڵێت: پەیامبەرﷺ فەرمووی: ((لا أشك ولا أسأل)) واتە: نە شك وگومانم هەیە ، وەنە لە كەسێكیش دەپرسم. ﴿٩٥ ولا تكونن من الذين كذبوا بآيات الله﴾ هەرگیز ناشێ لەوانە بیت كە بڕوایان بە ئایەت و نیشانەكانی خوا نییەو بەدرۆیان داناون ﴿فتكون من الخاسرين﴾ ئەوسا تۆش لە زیانباران دەبیت ﴿٩٦ إن الذين حقت عليهم كلمة ربك﴾ بێگومان ئەوانەی فەرمان و گفتی ئەزەلیی پەروەردگاری تۆیان لێهاتەدی، بۆ سزادانیان لەبەر بەدرۆدانان (وەك فیرعەون) ﴿لا يؤمنون﴾ باوەڕناهێنن ﴿٩٧ ولوجاءتهم كل آية حتى يروا العذاب الأليم﴾ ئەگەرچی هەمو بەڵگەو نیشانەیەكیشیان بۆبێت، تا سزای ئێش پێگەیەنەر بەچاوی خۆیان دەبینن ، دیارە ئەو كاتەش هیچ كەڵكی نابێ بۆیان.

**مەر قەومەكەی (یونس) بەر لەدیتنی سزا ئیمانیان هێنابێ:**

﴿٩٨ فلولا كانت قرية آمنت فنفعها إيمانها﴾ دەبا خەڵكی شارێ - لەو شارانەی هەرەشەیان لێكرا بە سزا، ئەگەر باوەڕ نەهێنن - بەر لە هاتنی سزا باوەڕیان هێنابا، تا باوەڕەكەیان سوودی هەبووبا بۆیان و لە سزاكە لادرابان، كەچی هیچ كامێكیان بەر لەدیتنی سزاكە باوەڕیان نەهێناو، بۆ دوایش سوودیان لێ نەبینی ﴿إلا قوم یونس﴾ بەڵام هۆزو نەتەوەكەی یونس ﴿لما آمنوا﴾ كاتێ باوەڕیان هێنا بەر لەهاتنی سزاكە ﴿كشفنا عنهم عذاب الخزی فی الحياة الدنيا﴾ ئێمەش سزای ئابڕوبەرو ریسواكەرمان لێلادان لەژیانی دنیادا، واتە: لەنێو گوندو شارە

پێشووەکاندا خەڵکێ نەبوو بەر لەکاتی دیتنی سزا باوەڕبێنن بە پەیامبەرەکەیان و سوودی بووبێ بۆیان، هۆزو نەتەوەکەی یونس نەبێ ﷺ , ئەوان بەر لەدیتنی سزاکە دەست بەجێ تەوبەیان کردو گەڕانەوە بۆلای خوا، خواش تەوبەی لێوەرگرتن و بەهرەمەندبوون ﴿ومتعناهم إلى حين﴾ وەتا ماوەیەکیش- پاش ئەوە – ژیانمانن و گوزەرانمان پێدان.

**مەردم بە زۆر باوەڕ ناهێنن:**

﴿٩٩ ولو شاء ربك لآمن من فى الأرض كلهم جميعا﴾ ئەگەر پەروەردگارت ویستبای بەزۆر باوەڕ بەخەڵك بێنێ, ئەوا هەرچی لەم زەوییەدایە (ئینس) و (جن) تێکرا, بە زۆر باوەڕیان دەهێنا ﴿افأنت تكره الناس﴾ ئاخۆ تۆ-ئەی پێغەمبەر-! لەخەڵك زۆر دەکەیت ﴿حتى يكونوا مؤمنين﴾ تا بەناچاری باوەڕبێنن و ببنە بڕوادار ؟! دیارە کاری وا ڕەوا نیە ﴿١٠٠ وما كان لنفس أن تؤمن إلا بإذن الله﴾ وە بۆ هیچ کەسێ نەبووە – بەئارەزووی خۆی- باوەڕ بێنێ، ئەگەر خوا نەیویستبێ، کەوابوو دڵگران مەبە بۆیان ﴿ويجعل الرجس على الذين لا يعقلون﴾ و خوا سزا بۆ ئەوانە دەبڕێتەوە کە: لە نیشانەکانی ئەو تێنافکرێن ، هەتا سوودیان لێ وەرگرن.

**لەئاسمان و زەویی بڕوانن چی دەبینن؟**

﴿١٠١ قل انظروا ماذا فى السموات والأرض﴾ بڵێ:- بەکافران- بەوردی سەیرێکی ئاسمانەکان و زەویی بکەن، بزانن چی دەبینن؟ بۆ بەڵگەی وەحدانیەت و تاك وتەنیایی خوا، لە خۆرو مانگ و شەوو ڕۆژو باران و هەورو و شاخ و ڕووبارو بەرزی و نزمیی و..هتد ﴿وما تغنى الآيات والنذر عن قوم لا يؤمنون﴾ ئەرچی ئەو هەموو بەڵگەو نیشانەو ترسێنەر و پێغەمبەرانە کار ناکاتە سەر گەلێك-لەئەزەل دا بە هۆی لاساری خۆیانەوە بۆیان برابێتەوە – باوەڕ ناهێنن ﴿١٠٢ فهل ينتظرون إلا مثل أيام الذين خلوا من قبلهم﴾ مەگەر هەر چاوەڕوانی ڕۆژانێك نین وەکو ڕۆژانی ئەوانەی بەرلەوان بوون و نەمان ؟ وە کو ڕۆژەکانی گەلی نووح و عادو سەموود.. ﴿قل انتظروا إنى معكم من المنتظرين﴾ بە هەڕەشەوە پێیان بڵێ: دەسا ئێوە چاوەڕوان بن بۆ سزا، بەڕاستیی منیش لەگەڵ ئێوەدا لە چاوەڕوانانم بۆ تیاچوونتان ﴿١٠٣ ثم ننجى رسلنا والذين آمنوا﴾ پاشان لەنێو ئەواندا پەیامبەرەکانمان و ئەوانەی باوەڕیان هێناوە لەو سزایە ڕزگاردەکەین ﴿كذلك حقا علينا ننجى المؤمنين﴾ ئاواش مافێکی نەگۆڕاوە لەسەر ئێمە: کە دەبێ بڕواداران لەوجۆرە بەڵایانە ڕزگار بکەین .

سُورَةُ يُونُس — الجزء الحادي عشر

فَلَوْلَا كَانَتْ قَرْيَةٌ ءَامَنَتْ فَنَفَعَهَآ إِيمَٰنُهَآ إِلَّا قَوْمَ يُونُسَ لَمَّآ ءَامَنُواْ كَشَفْنَا عَنْهُمْ عَذَابَ ٱلْخِزْىِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَمَتَّعْنَٰهُمْ إِلَىٰ حِينٍ ﴿٩٨﴾ وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَءَامَنَ مَن فِى ٱلْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا ۚ أَفَأَنتَ تُكْرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُواْ مُؤْمِنِينَ ﴿٩٩﴾ وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تُؤْمِنَ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ وَيَجْعَلُ ٱلرِّجْسَ عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يَعْقِلُونَ ﴿١٠٠﴾ قُلِ ٱنظُرُواْ مَاذَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَمَا تُغْنِى ٱلْءَايَٰتُ وَٱلنُّذُرُ عَن قَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠١﴾ فَهَلْ يَنتَظِرُونَ إِلَّا مِثْلَ أَيَّامِ ٱلَّذِينَ خَلَوْاْ مِن قَبْلِهِمْ ۚ قُلْ فَٱنتَظِرُوٓاْ إِنِّى مَعَكُم مِّنَ ٱلْمُنتَظِرِينَ ﴿١٠٢﴾ ثُمَّ نُنَجِّى رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ۚ كَذَٰلِكَ حَقًّا عَلَيْنَا نُنجِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٠٣﴾ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمْ فِى شَكٍّ مِّن دِينِى فَلَآ أَعْبُدُ ٱلَّذِينَ تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَٰكِنْ أَعْبُدُ ٱللَّهَ ٱلَّذِى يَتَوَفَّىٰكُمْ ۖ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٠٤﴾ وَأَنْ أَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٠٥﴾ وَلَا تَدْعُ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكَ وَلَا يَضُرُّكَ ۖ فَإِن فَعَلْتَ فَإِنَّكَ إِذًا مِّنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠٦﴾

٢٢٠ وَإِن يَمْسَسْكَ

**خوا بەتەنیا بپەرستن و پاڵی پێوە بدەن:**

﴿١٠٤ قل ياأيهاالناس إن كنتم فى شك من دينى﴾ بڵێ ئەی خەڵکینە ! ئەگەر ئێوە لە ڕاستیی و دروستی ئەم ئایینەم بەگومان و دوودڵن ﴿فلا اعبد الذين تعبدون من دون الله﴾ دڵنیابن –جگە لەخوای گەورە- ئەوانەی وا ئێوە

ئەیانپەرستن, من نایانپەرستم ﴿ولكن اعبد الله الذی یتوفاكم﴾ و بەڵكو من هەر ئەوخوایە دەپەرستم كە ئێوە
ئەمرێنیٚ ﴿وامرت ان اكون من المؤمنین﴾ و فەرمانیشم پێكراوە كە: لەبڕواداران بم ﴿[105] وان اقم وجهك للدین
حنیفا﴾ و پێیشم وتراوە كە: دەبیٚ بەڕاست و ڕەوانی، هەر لە ئایینی ئیسلام ڕووبكەم ﴿ولا تكونن من المشركین﴾ و
دەستووریشم پێدراوە كە هەرگیز لە موشریكان نەبم ﴿[106] ولا تدع من دون الله ما لا ینفعك ولا یضرك﴾ ونابیٚ جگە
لەخوا، شتیٚ وا بپەرستیی كە: نە سوودت پیٚ بگەیەنێت نەزیانت لێبدا ﴿فإن فعلت فإنك إذا من الظالمین﴾ جائەگەر
كاری واتكرد، واتە:هاوارت بۆ غەیری خوا برد، بێگومان تۆ لە ستەمكارانی و، چاوەڕوانی سزاشبە ﴿[107] وإن
یمسسك الله بضر فلا كاشف له إلا هو﴾ ئەرخواش تووشی زیانێكی كردیت ، جگە لەخۆی هیچ لادەرێكی نییە ﴿وإن
یردك بخیر فلا راد لفضله﴾ و ئەگەر نیازی چاكەیەكی
پێكردیت، دیسان هیچ ڕەتكەرەوەیەكی نیە، مەبەست ئەوەیە
كە تەنها خوایە دەتوانیٚ چاكەو خراپە، كەڵك و زیان بهێنیٚ،
یان لای بدات لێت، كەوابوو دەبیٚ تەنها ئەویش بپەرستیی و
هەر لەویش هاوار بكەیت. (ئیبن كەسیر) لە (ئەنەس)ـەوە
فەرموودەیە دەگێڕێتەوە دەڵێت : (اطلبوا الخیر دهركم كله،
وتَعَرّضوا لنفحات رحمة الله، فإن لله نفحات من رحمته،
یصیب بها من یشاء من عباده، واسألوه أن یستر عوراتكم،
ویؤمن روعاتكم). واتە:هەمیشە خێرو چاكە بخوازن و،
بەردەوامیش خۆ بخەنە بەر سۆزو نەسیمی خوا، چونكە
میهرەبانی خوا گەلیٚ زۆرە، بەهەركەسێكیش حەز بكا
لەبەندەكانی دەیداتیٚ.. دەسا داوا بكەن باكەم و
كورتیەكانتان داپۆشیٚ و، لەترسیش ئەمینتان بكاتەوە
﴿یصیب بە من یشاء من عبادە﴾ و حەز بەچارەی
هەركەسێك بكات لەبەندەكانی خۆی، میهرەبانیی
پێدەبەخشیٚ و، تووشی چاكەی دەكات ﴿وهو الغفور
الرحیم﴾ تەنها هەر خۆیەتی زۆر پۆشەرو لێبوردە، میهرەبان
و ڕەحیم و دلۆڤان ﴿[108] قل یا ایها الناس قد جاءكم الحق من ربكم﴾ بڵیٚ: ئەی خەڵكینە! وا لەلایەن
پەروەردگارتانەوە قورئان و پێغەمبەرتان بۆ هات ﴿فمن اهتدی﴾ ئینجا هەر كەسێك ڕییٚ ڕاست بەدی بكا ﴿فإنما
یهتدی لنفسه﴾ دیارە هەر بۆ خۆی ڕێنوێنەو، كەڵكی هەر بۆخۆی دەبێت ﴿ومن ضل فإنمایضل علیها﴾ هەر
كەسێكیش گومڕاو سەلێشێواو بوو، هەرخۆی زیانی لێدەكەوێت ﴿وما انا علیكم بوكیل﴾ خۆ منیش بریكاری ئێوەم
نیم، هەتا كارو كردەوەتان بپارێزم و ڕاستتان بكەمەوە ﴿[109] واتبع ما یوحی إلیك﴾ هەرلەو فەرمانە پەیڕەوی بكە
بەوەحیی بۆتدیٚ ﴿واصبر حتی یحكم الله﴾ وئارامت بییٚ – لەژێر ئازارو ئەشكەنجەدا– تائەو ڕۆژە دێت كەخوا
بۆخۆی داوەریی دەكا ﴿وهو خیر الحاكمین﴾ و كە هەر ئەویشە لە گشت دادوەرەكان بۆ بەندەكانی خۆی بەعەداڵەت
ترو باشترە، چونكە بەهەق و عەداڵەت داوەریی دەكا. هەندیٚ ئەڵێن: ئەم ئایەتەی (واصبر) بە ئایەتی (قیتال) نەسخ



وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ وَإِن
يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلَا رَآدَّ لِفَضْلِهِۦ يُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ
وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٠٧﴾ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَكُمُ
ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِى لِنَفْسِهِۦ وَمَن
ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا وَمَآ أَنَا۠ عَلَيْكُم بِوَكِيلٍ ﴿١٠٨﴾ وَٱتَّبِعْ
مَا يُوحَىٰٓ إِلَيْكَ وَٱصْبِرْ حَتَّىٰ يَحْكُمَ ٱللَّهُ وَهُوَ خَيْرُ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴿١٠٩﴾

ترتيبها ١١ سُورَةُ هُودٍ آياتها ١٢٣

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓر كِتَٰبٌ أُحْكِمَتْ ءَايَٰتُهُۥ ثُمَّ فُصِّلَتْ مِن لَّدُنْ حَكِيمٍ خَبِيرٍ ﴿١﴾
أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّا ٱللَّهَ إِنَّنِى لَكُم مِّنْهُ نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ ﴿٢﴾ وَأَنِ ٱسْتَغْفِرُوا۟
رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوٓا۟ إِلَيْهِ يُمَتِّعْكُم مَّتَٰعًا حَسَنًا إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى وَيُؤْتِ
كُلَّ ذِى فَضْلٍ فَضْلَهُۥ وَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ
كَبِيرٍ ﴿٣﴾ إِلَى ٱللَّهِ مَرْجِعُكُمْ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٤﴾ أَلَآ إِنَّهُمْ
يَثْنُونَ صُدُورَهُمْ لِيَسْتَخْفُوا۟ مِنْهُ أَلَا حِينَ يَسْتَغْشُونَ ثِيَابَهُمْ
يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٥﴾

کراوەتەوە. (ئیبن عەباس)یش ئەڵێ: هەر کە ئەم ئایەتە هات، پێغەمبەرﷺ خێرا ئەنسارییەکانی کۆ کردەوەو فەرمووی: (إنكم سترون بعدي أثرة، فاصبروا حتى تلقوني) بوخاریی/كتاب الفتن ٩٢/ بابی/٢. واتە: پاش من دەبینن کەخەڵکی لەبەردنیا ئیش وکاریان پێ دەسپێردرێ (واتە: لەسەردەمی مندا روونادات) دەسا تادەگەنە من بە ئارام وخۆ ڕاگرین و مەیکەنە هەراو کێشە.

کۆتایی تەفسیری ( یونس ) زۆر سوپاس بۆخوای کارجوان.

*** *** ***

## ١١- سوورەتی ( هوود )ـە

## مەککەییەو ( ١٢٣ ) ئایەتە.

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتە خاوەنشکۆیە، وەکو سوورەتەکانی تری مەککە باس دەکا لە بیروباوەڕو یەکخواپەرستیی و، پەیام و، پاداش وتۆڵە، کەمێکیش درێژە دەدا بەداستانی هەندێ لە پەیامبەران ﷺ بۆ دڵدانەوەی سەرداری پەیامبەران موحەممەد ﷺ تا بەئارام و خۆ ڕاگربێ لەسەر ئازارو ئەشکەنجەی دڵڕەقەکانی قورەیش، بە تایبەت پاش مردنی (ئەبوو تالیبی) مامیی و، (خەدیجە) خاتوونی هاوسەریی: ئایەتەکان پەیتا پەیتا دەهاتن، نەهامەتی و بەڵای پەیامبەرانیان بۆ باسدەکرد، بۆ دڵقایم بوونی و، ماندوو نەبوونیی. بۆ یەکەمجار (قورئان) دەنرخێنێ کە :چەندە ڕاست و دروستەو، هیچکات ناتەواویی و نەگونجاویی تێدا نییە، چونکە لەلایەن خوایەکی زاناو داناوە نێردراوە،، ئینجا هەندێ بەڵگەی بوونەوەر دەخاتە پێش چاویان، بەڵکو لە سەرکێشی خۆیان بسڵەمێنەوەو، بەتەنیا روو لەخوا بکەن، گەلێ نموونەشیان بۆ دێنێتەوە و، پاشان دەڵێ: کەڕو کوێرو بیناو ژنەوا وەکو یەک نین، پاشان دێتە سەرباسی پەیامبەرەکان، بۆ یەکەمجار لە (نووح)ـە وە دەست پێ دەکات، چونکە "لە پاش تۆفانەکەوە" بە باوکی دووەمی ئادەمزاد دادەنرێ. وەلە هەمووشیان تەمەندرێژترو، بە ئارامتریش بووە، پاش ئەویش باسی (هوود) دێت- کەئەم سوورەتەی بەردەستمان، لەبەر قارەمانێتی و جوامێریی خۆی بە ناوی ئەوەوە ناونراوە، پەیامبەری گەلێکی سەرسەختی کەللە رەقی بێ وێژدانی لەخشتەچووی بەلاشەو قەبارەبوون !، بۆیە خوا (با)یەکی زۆر توندو ساردو سەختی بۆ ناردن و لەریشە هێنانی . بۆ دواتر باسی (صالح) پەیامبەر دێت، لەپاشان (لووت)یش، ئینجا (شوعەیب و موساو هاروون) سەلامی خوا لەسەرهەموویان بێت. لە کۆتاییدا بەسەرهاتی چەند نەتەوەو گەلێ باس دەکات بۆ پەندو ئامۆژگاریی قورەیش و هاوبیرەکانیان، بەشکو دابچڵەکێن و، دەست لەو ئازارو ئەشکەنجە بەرامبەر بە پەیامبەر ﷺ هەڵبگرن . لەبەر گرنگی و سامناکی ئەم سوورەتەیە لە (مەسەندی) ئەبو (یەعلا)دا -کە ترمزیی هێناویەتی- : (ئەبووبەکر) خوا ڕازیی بێ لێی وتی: لە پێغەمبەرم پرسی ﷺ: بۆچی وا زوو پیربوویت ؟! ((قال: شيبتني سورة هود ، والواقعة، وعم يتساءلون، وإذا الشمس كورت)، وفي رواية (هود و أخواتها)) فەرمووی: سوورەتەکانی (هوود، واقیعە، نەبەء، تەکویر) لە ڕیوایەتێکدا دەڵێ: (هوود) و هاو وێنەکانی ئەو بوو پیریانکردم !.

### قورئان بەڵگەی تاك و تەنیایی خوایە :

﴿بسم الله الرحمن الرحيم* [1] الر﴾ ئەم جۆرە پیتانەش هەر لەوپیتانەن کەئەم قورئانەیان لێپێکهاتووە، دەسا ئەگەر دەتوانن ئێوەش وێنەی بهێنن ﴿كتاب احكمت آياته﴾ ئەم نامەیە- کە لە لایەن خواوە نێردراوە – کتێبێکە گشت ئایەتەکانی ڕێك و پێکن دەستکاری ناکرێن. ﴿ثم فصلت من لدن حكيم خبير﴾ لەپاشان هەر لەلایەن خوایەکی

کاردروستی ئاگادارەوە" نەك لە لایەن ئەو پەیامبەرەوە -وەك ئەوان دەڵێن- بەجوانی حەڵاڵ و حەرامەکانی شییکراونەتەوە ﴿[٢] الا تعبدوا إلا الله﴾ نێردراوە کە بەئێوە بڵێ: بێجگە لە خوای باڵادەست نابێ کەسیدی بپەرستن ﴿إننی لکم منه نذیرو بشیر﴾ چاکیش بزانن کە: من لەلایەن ئەو (خوا) لەکارزانەوە ترسێنەرو موژدەدەرم بۆگشت خەڵکانی راساڵ و لاسار ﴿[٣] وان استغفروا ربکم ثم توبوا إلیه﴾ کە دەبێ لە پەروەردگاری خۆتان داوای لێبوردن بکەن، پاشان تەوبە لەشیرك بکەن و بگەڕێنەوە بۆ لای ئەو ﴿یمتعکم متاعا حسنا إلی أجل مسمی﴾ ئەوسا ئەویش هەتا ماوەیەکی دیارییکراو بۆتان بەهرەمەندتان دەکات و بە خۆشیی رائەبوێرن و بۆخۆتان دەژین ﴿ویؤت کل ذی فضل فضله﴾ وە فەزڵ و چاکەی خۆی دەدا بە هەموو خاوەن فەزڵ و چاکەیەك ﴿وان تولوا فإنی اخاف علیکم عذاب یوم کبیر﴾ خۆ ئەر لە باوەڕهێنان روویان وەرچەرخاند، ئەوا بێگومان من لەسزای رۆژێکی گەورەتان دەترسم , واتە: رۆژی قیامەت ﴿[٤] إلی الله مرجعکم﴾ بەئاگاشبن کە: تەنها بەرەو لای خوا دەگەڕێنەوە ﴿وهو علی کل شئ قدیر﴾ ئەویش بەسەر هەموو شتێکدا بەدەسەڵات و بەتوانایەو، پاداش و تۆڵەی کشتکارێکتان دەداتەوە.

**خوا لە هەموو شتێ بەئاگایە :**

(ئیبن عەبباس) دەڵێ: (ئەخنەسی کوڕی شورەیق) کاتێ سەردانی پەیامبەری کرد, سوێندی بۆ خوارد کە: من تۆم زۆر خۆشدەوێ، کەچی دڵی پڕبوو لە پیلان و نیفاق, جا ئەم ئایەتە هات وفەرمووی: ﴿[٥] الا إنهم یثنون صدروهم﴾ چاك بێداربن ! کە: ئەو کافرو موشریکانە سەرو سینگیان خوار دەکەنەوەو سرتە سرت دەکەن دژی موسڵمانەکان ﴿لیستخفوا منه﴾ تابە خەیاڵی خۆیان بەو سرتە سرتەیان گزیی و پیلانەکانیان لەخوا بشارنەوەو دەرنەکەوێ !﴿الا حین یستغشون ثیابهم﴾ چاك هوشیاربن! ئەوکاتە کە بەجل وبەرگەکانیان سەروسینگیان دادەپۆشن، -تاپیلانەکانیان دەرنەکەون- خوای باڵادەست بەهەموو شتێکیان بەئاگایە. ﴿یعلم ما یسرون وما یعلنون﴾ بەهەموو ئەوشتانەیان دەزانێ کە: دەیشارنەوە، یان دەیخەنە روو و بەئاشکرا دەیکەن ودەیڵێن ﴿إنه علیم بذات الصدور﴾ چونکە بۆ خۆی زانایە، بە هەرشتێ لە سینگ ولە نێو دڵەکاندایە، چ جای پیلان و سرتە سرتیان.

زۆر سوپاس بۆ خوایکارجوان کە لەم جزمی (١١)یە بوومەوە لە (٢٧)ی شەعبانی (١٤١٥)ك، بەرامبەر بە کانوونی دووەمی (١٩٩٥)ی ز، بەردەوامیش چاوەڕوانی فەزڵ و میهرەبانیی و دلۆڤانێتی ئەوم.

کۆتایی جزمی (١١) یازدە

ولله الحمد والمنة

*** *** ***

﴿[٦] وما من دابة فی الأرض إلا علی الله رزقها﴾ هەموو رەوکەرو گیان لەبەرێکی ئەم زەوییە (مرۆڤ و ئاژەڵ و زیندەوەرانی تر) ژیان و گوزەرانیان هەموو لەسەر خوایەو، بۆخۆیشی بڕیاریداوە کە: دەبێ بیانژیینێ ﴿ویعلم مستقرها ومستودعها﴾ بێ لەوەیش، بەشوێن و بنکەی سەرەکیی و، جێی ئەمانەت و کاتیشیان ئاگادارەو دەزانێ، یان بڵێین: چاك دەزانێ لەکوێ دەژین و، لەکوێش دەمرن ﴿کل فی کتاب مبین﴾ سەر لەبەری هەموو ئەوانە لە نامەیەکی روون ، واتە لە (لوح المحفوظ)دا پێش ئەوەی کەبوونەوەر دروست بکرێ لای خوا نوسراوە، ئایەتی: (٣٨) لە سوورەتی (ئەنعام) کە دەفەرموێ: (وما من دابة فی الأرض ولا طائر یطیر بجناحیه..) لەگەڵ (وعنده مفاتح الغیب لا یعلمها إلا هو..) ٥٩/٦ هەر جەخت لە سەرئەو راستییە دەکەنەوە.

**ئاسمان و زەویی وەدیهێناو تەختی فەرمانڕەواییشی لەسەر ئاوبوو:**

﴿[٧] وهو الذی خلق السموات والأرض فی ستة ایام﴾ هەر ئەوخوایەیە ئاسمانەکان و زەویی لەماوەی شەش ڕۆژدا دروستکرد، جا ئیتر خوایەکی بەدەسەلاتی ئاوا، چۆن ناتوانێ زیندووتان بکاتەوە ؟ ﴿وکان عرشه علی الماء﴾ وهێمان تەخت و عەرشەکەیشی -پێش دروستبوونیان- هەر لەسەر ئاوبوو، لەم بارەیەوە ئەم فەرموودانەش هاتوون: یەکەم/ لە (مەسنەدی پێشەوا ئەحمەد)دا هاتووە: (عوقەیلیی) دەڵێ: لەپێغەمبەرم ﷺ پرسی :(این کان ربنا قبل أن یخلق خلقه؟) ئاخۆ بەر لە دروستکردنی بەدیهێنراوەکان ،پەروەردگارمان لە کوێ بووبێ ؟! ((قال: کان فی عماء)) أی فوق سحاب عالیا علیه ما تحته هواء وما فوقه هواء) فەرمووی: بەرزو بڵندبوو لەسەر هەورێك ، نە لەژێریەوە (هەوا) هەبوو، نە لەبانیەوە ((ثم خلق العرش بعد ذلك)) پاش ئەوەعەرشەکەیشی دروستکرد. دووەم/ سئل ابن عباس عن قول الله: (وکان عرشه علی الماء) علی ای شئ کان الماء؟ قال: علی متن الریح/ إسناده صحیح. لە (ئیبن عەباس) دەپرسن: ئەرێ باشە کە تەختی فەرمانڕەوایی خوا لەسەر ئاو بووبێت، دەبێ ئاوەکە لەسەرچی بووبێت؟ گوتی: لەسەر پشتی ((با)) بوو! سێیەم / وفی صحیح ((مسلم)) عن عبدالله بن عمرو قال: قال رسول الله ﷺ: ((إن الله قدر مقادیر الخلائق قبل أن یخلق السموات والأرض بخمسین الف سنة، کان عرشه علی الماء))، واتە: بەر لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەویی (بەپەنجا هەزار ساڵ) خوای گەورە ئەندازەگیری گشت شتێکی کردو، ئەو دەمەش عەرشەکەی لەسەر ئاو بوو. ﴿لیبلوکم ایکم أحسن عملا﴾ ئەم بوونەوەرەی دروستکرد بۆئەوەی تاقییتان بکاتەوە: ئایا کامتان کردەوەتان چاکترە ﴿ولئن قلت إنکم مبعوثون من بعد الموت﴾ سوێند ئەخۆم ئەگەر بشڵێیت: بێ شك ئێوە پاش مردن زیندوو ئەکرێنەوەو تۆڵە دەدرێن ﴿لیقولن الذین کفروا﴾ بە تەئکید ئەوانەی کە کافرو بێ باوەڕن ئەڵێن: ﴿إن هذا إلا سحر مبین﴾ ئەم قسەو باسە تۆ دەیکەیت و دەیڵێیت جادوویەکی ئاشکرا بەولاوە شتێکی تر نییە ﴿[٨] ولئن اخرنا عنهم العذاب إلی أمة معدودة﴾ خۆ ئەر بۆ ماوەو ساتێکی ژمێرراوو کەمیش بێت سزایان لێ دوور بخەینەوە ﴿لیقولن ما یحبسه﴾ خێرا بەگاڵتەوە ئەڵێن: باشە ئەبێ ئەو سزایە چی دوای خستبێت، بۆ نەهات ؟! ﴿ألا یوم یأتیهم لیس مصروفا عنهم﴾ بێداربن! کەئەو ڕۆژەی سزایان بۆدێ ، قەت لێیان لانادرێ و، خۆ دەرباز ناکەن و، کەسێکیش ناتوانێ قوتاریان بکا لێی ﴿وحاق بهم ماکانوا به یستهزئون﴾ وە ئەو سزایەش ئەوان گاڵتەیان پێ دەکرد دووچاریان ئەبێ و داوێنیان ئەگرێت.

**مرۆ زۆر سپڵەو بێ بارە:**

﴿⁹ ولئن أذقنا الإنسان منا رحمة﴾ بێ سۆ ئەگەر لەفەزڵ و میهرەبانیی خۆمانەوە خۆشیی و ئاسوودەییمان
بەئادەمزاد چێشتبا، واتە: رزق و رۆزیی فراوانمان پێدابا ﴿ثم نزعناها منه﴾ پاشان -هەربۆ تاقیکردنەوە- لێمان
سەندبایەتەوە ﴿إنه لیؤس کفور﴾ بێگومان زۆر بێ ئومێدو سپڵەو ناسوپاس دەبێ ﴿¹⁰ ولئن أذقناه نعماء بعد ضراء
مسته﴾ خۆ ئەگەر دوای ئەو تەنگانەیەش خۆشیی و لەشیساغ و رزق و رۆزیمان پێچێشتبا ﴿لیقولن ذهب السیئات
عنی﴾ بە فیزێکەوە ئەڵێ: تازە ئیتر هەرچی مایەی بەدی و ناخۆشیی بوو لێمانەوە دوورکەوتەوەو، کاتی بەسەرچوو
و، جارێکی تر هەژاریی و ناخۆشیی دووچارم نابێتەوە! ﴿إنه لفرح فخور﴾ دەبینی کە هەمیشە لەخۆشیی و خۆ
قەفکردن و بایی بوون و چەواشە گەریدایەو، رێی راست ناگرێت، مرۆڤی لارولاسارو بێ دین هەردەم ئاوایە ﴿¹¹ إلا
الذین صبروا وعملوا الصالحات﴾ جگە ئەوانەی وا ئارامیان هەیەو، لەکاتی نارەحەتیدا خۆیان دەگرن و، ئاکارە
چاکەکانیش ئەنجام دەدەن، لەکاتی فراوانی رزق و رۆزی و خۆشحاڵیدا ﴿أولئك لهم مغفرة وأجر کبیر﴾ بەشی ئەوانە
لێبوردن و پاداش و مزەی زۆر فراوان و گەورەیە لای خوا.

**موشریکان پێغەمبەر تەنگەتاو دەکەن:**

﴿¹² فلعلك تارك بعض ما یوحی إلیك﴾ ئەی پێغەمبەر! ﷺ لەبەر سووربوونیان لەسەر کوفرو بێ باوەڕیی،
خەریکە لەهەندێ لەو قورئانەی بە وەحیی و بەسروش بۆتدێ خۆت هەلاوێری ﴿وضائق به صدرك﴾ و لەوانەشە
سینگ و دڵت تەنگ ببێ ﴿أن یقولوا لولا أنزل علیه کنز﴾ کە دەڵێن: ئەوە بۆ گەنجینەیی و سامانێکی بۆ دانەبەزێنرا
لەزێروو لە زیوو.. هتد.. بائاوا هەژارو بێ نەوا نەبووبا! ﴿أو جاء معه ملك﴾ یان ئەی بۆ فریشتەیەکی لەگەڵ نەهات؟
شایەتی بۆ بدات ﴿إنما أنت نذیر﴾ جا تۆ لەبەر قسەی ئەوانە خەفەت مەخۆ -ئەی پێغەمبەر! ﷺ -چونکە تۆ تەنها
هەر ترسێنەرو گەیەنەریت، جا ئیتر لە باتی دڵگرانیی و نارەحەتی، دڵخۆش و سینگ گوشاد بەو، لەو قسانەیان
نیگەران مەبە بەڵکو وەکو ئەوهەموو پێغەمبەرانەبە بەرلەخۆت بوون، چونکە هەموو تانەو تەشەرێکیان لێدان و
بەئارامیشبوون ﴿والله علی کل شئ وکیل﴾ وە خوا خۆیشی بەسەر هەموو شتێکا ئاگادارو بریکارو چاودێرە ﴿¹³ أم
یقولون إفتراه﴾ یان دەڵێن: موحەممەد ﷺ خۆی ئەم قورئانەی هەڵبەستووەو داویەتە پاڵی خوا ؟! ﴿قل فأتوا بعشر
سور مثله مفتریات﴾ پێیان بڵێ: جا ئەگەر ئێوە ئەو قورئانە بەدرۆو هەڵبەسراو دەزانن، دەسا فەرموون ئێوەش دە
سوورەتی هەڵبەستە -وەك خۆتان دەڵێن- وەکو ئەو بهێنن کە لەهەموو روویەکەوە وەکو ئەو وابن. بەڵێ.. پاش
بەرامبەر وەستانیان و "تەحەددا" کردنیان بە هێنانی دە سوورەت وەکو ئەو، ئەوساش دەسەوسان وەستانیان و،
یەککەوتنیان" فەرمووی: دە ئەگەر ئەوەشتان پێناکرێ" دە فەرموون تەنها یەك سوورەت بهێنن. ﴿وادعوا من
استطعتم من دون الله﴾ هەرکەسیش دەتوانن -بێ لەخوا- بانگی بکەن بۆ هاوکارییتان ﴿إن کنتم صادقین﴾ ئەگەر
راست ئەکەن دەڵێن ئەم قورئانە درۆو هەڵبەستراوە ﴿¹⁴ فإن لم یستجیبوا لکم﴾ جا ئەگەر خوا نەناسان وەلامتانیان
نەدایەوەو نەیانتوانی ئەو کارە بکەن- کەهەرگیز ناشتوانن- ﴿فاعلموا أنما أنزل بعلم الله﴾ ئەوە ئیتر چاك بزانن و
یەقینتان هەبێ کە بەڕاستیی ئەو قورئانە هەر بە ئاگاداری و زانینی خوا ناردراوەتە خوارەوە، دەست هەڵبەسراوی
هیچ کەسێك نیە ﴿وأن لا إله إلا هو﴾ و دڵنیاشبن کە لە:خوای پەروەردگار بەدەر، هیچ شتێك نییە شیاوی پەرستن
بێت بە هەق ﴿فهل أنتم مسلمون﴾ دە ئایا ئیتر ئێوە تەسلیم و ملکەچ دەبن و خۆ بەدەستەوە دەدەن؟

**ئەوی دنیا ویست بێ ، قیامەتی نابێ :**

﴿<sup></sup>١٥ **من كان يريد الحياة الدنيا وزينتها**﴾ هەرکەسێك تەنها ژیانی ئەم دونیایەو جوانیی و زەرق و بەرقی ئەوی بوێ و، پاشەڕۆژ پشتگوێ بخا ﴿**نوف إليهم أعمالهم فيها**﴾ ئەوا ئێمەش هەر لەم دونیایەدا بەتێروتەسەلی پاداشی گشت هەوڵ و کردەوە چاکەکانیان -وەك سەردانی خزمان و..هتد- دەدەینەوە، بەتەندروستیی و ئاسوودەیی و ڕۆزیی و ناوو شۆرەتی دنیا ﴿**وهم فيها لا يبخسون**﴾ هیچیشیان لێ کەمناکرێتەوە ﴿١٦ **أولئك الذين ليس لهم في الآخرة إلا النار**﴾ ئەوانە لەدوا ڕۆژدا -جگە لەئاگر- هیچ بەش و بەهرەیەکیان نییە ﴿**وحبط ما صنعوا فيها**﴾ و هەر هەوڵ و چاکەیەکیشیان لەدونیادا کردبێ ، گشتی بەفیڕۆو بێهوودە دەچێت ﴿**و باطل ما كانوا يعملون**﴾ و باتڵ و ناحەق و ناڕەوایە ئەوەی کردیان . لەجێگایەکی تردا خوا ئەفەرموێ: (من كان يريد العاجلة عجلنا له فيها ما نشاء لمن نريد ثم جعلنا له جهنم يصليها مذموما مدحورا.. ومن أراد الأخرة وسعى لها سعيها وهو مؤمن فأولئك كان سعيهم مشكورا .. وللآخرة أكبر درجات وأكبر تفضيلا) ١٧/١٨-٢١.

**مرۆڤی بەرچاو ڕوون باوەڕی بەقورئان هەیە :**

﴿١٧ **افمن كان على بينة من ربه**﴾ ئاخۆ کەسێك لەلایەن پەروەردگاریەوە بەڵگەیەکی ئاشکراو ڕوونی هەبێ ﴿**ويتلوه شاهد منه**﴾ و هەر لەلایەن ئەویشەوە شایەدێك، واتە: جبریل هەبێ و قورئانی بۆ بخوێنێتەوە ؟! ﴿**ومن قبله كتاب موسى إماما ورحمة**﴾ وبەر لە قورئانیش نامەو تەوراتەکەی موسا ﷺ -کە بۆ گەلی بەنی ئیسرائیل- پێشەواو ڕەحمەت بوو، شایەدی لەسەر ڕاستیی بدات, ئاخۆ ئەم جۆرە کەسە واتە: پێغەمبەرو هەرئیمانداریك وەکو ئەو خەڵکە بێ بەڵگەو دونیا ویست و بێ باوەڕە وایە ؟ ﴿**اولئك يؤمنون به**﴾ ئەوانە گەلێکی ڕاستیخوازن و، باوەڕ بەم قورئانە دەکەن ﴿**ومن يكفر به من الأحزاب**﴾ و هەر کەسیش لە کۆمەڵەکانی تری دنیا، حاشای لێ بکاو باوەڕی پێنەهێنێ ﴿**فالنار موعده**﴾ بێگومانە کە ئاگری دۆزەخ جێیەتی ﴿**فلا تك فى مرية منه**﴾ جا کەوابوو تۆ هیچ جۆرە گومانێکت لەڕاستیی و دروستیی ئەم قورئانە نەبێ ﴿**إنه الحق من ربك**﴾ چونکە هەر ئەوە هەق و ڕاست و دروست و، لەلایەن پەروەردگارتەوە بۆت هاتووە ﴿**ولكن أكثر الناس لا يؤمنون**﴾ بەڵام زۆربەی ئەو خەڵکە بەکوێرانەو ، بێ ئەوەی هیچ جۆرە بەڵگەو زانستێکیان لابێ، باوەڕناهێنن بەم ڕاستییە !.(ئەنەس) ئەم فەموودەیەی هێناوەو دەڵێت فەرمووی: (والذى نفس محمد بيده لايسمع بى أحد من هذه الأمة، يهودى ولانصرانى ثم يموت ولم يؤمن بالذى أرسلت به إلا كان من أصحاب النار/موسليم-كتاب الإيمان (١٥٣) بابى(٧.) واتە: سوێندم بەخوا، هەر کەسێ ناوی من ببیسێ -لەم ئوممەتەو لە موسایی و لە عیسایی- و باوەڕیشم پێنەکا، دڵنیابن جێگای دۆزەخە.

الجزء الثاني عشر — سورة هود

أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ قُلْ فَأْتُوا۟ بِعَشْرِ سُوَرٍ مِّثْلِهِۦ مُفْتَرَيَٰتٍ
وَٱدْعُوا۟ مَنِ ٱسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٣﴾
فَإِلَّمْ يَسْتَجِيبُوا۟ لَكُمْ فَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَآ أُنزِلَ بِعِلْمِ ٱللَّهِ وَأَن لَّآ إِلَٰهَ
إِلَّا هُوَ ۖ فَهَلْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٤﴾ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْحَيَوٰةَ
ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَٰلَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لَا يُبْخَسُونَ
﴿١٥﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَيْسَ لَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ إِلَّا ٱلنَّارُ ۖ وَحَبِطَ
مَا صَنَعُوا۟ فِيهَا وَبَٰطِلٌ مَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٦﴾ أَفَمَن كَانَ
عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّهِۦ وَيَتْلُوهُ شَاهِدٌ مِّنْهُ وَمِن قَبْلِهِۦ كِتَٰبُ
مُوسَىٰٓ إِمَامًا وَرَحْمَةً ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ۚ وَمَن يَكْفُرْ بِهِۦ
مِنَ ٱلْأَحْزَابِ فَٱلنَّارُ مَوْعِدُهُۥ ۚ فَلَا تَكُ فِى مِرْيَةٍ مِّنْهُ ۚ إِنَّهُ ٱلْحَقُّ
مِن رَّبِّكَ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٧﴾ وَمَنْ
أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ يُعْرَضُونَ
عَلَىٰ رَبِّهِمْ وَيَقُولُ ٱلْأَشْهَٰدُ هَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ كَذَبُوا۟ عَلَىٰ
رَبِّهِمْ ۚ أَلَا لَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٨﴾ ٱلَّذِينَ يَصُدُّونَ
عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبْغُونَهَا عِوَجًا وَهُم بِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ كَٰفِرُونَ ﴿١٩﴾

٢٢٣

**درۆ بەناوی خواوە دەکەن و ، ڕێگاکەیشی لەمەردم دەبەستن:**

﴿[١٨] ومن اظلم ممن افترى على الله كذبا﴾ دەبێ کێ لەوکەسە ستەمکار تربێت کە: لەسەر خوا درۆ هەڵبەسێ و هاوبەشی بۆ بڕیار بدات ؟ ﴿اولئك يعرضون على ربهم﴾ گشت ئەوانە لە ڕۆژی دواییدا لە خزمەتی پەروەردگاریاندا ڕادەنوێنرێن بۆ پرسیارو وەڵام ﴿ويقول الأشهاد﴾ و شایەتگەلێکی زۆر (لە ئیمانداران و فریشتەو پەیامبەران) لە ڕۆژی قیامەتدا دێن و شایەتیان لەسەر دەدەن وئەڵێن: ﴿هؤلاء الذين كذبوا على ربهم﴾ ئەمانە بوون — لە دونیادا— لەسەر پەروەردگاریان درۆیان کردو، هاوڕێ و هاوەڵیان بۆدانا ﴿الا لعنة الله على الظالمين﴾ دەبا نەحلەت و نەفرینی خوا لەخەڵکانی ناهەقکارو ستەمکار بێت ﴿[١٩] الذين يصدون عن سبيل الله﴾ ئەوانەی کەرێگای خوا لەخەڵکی دەبەستن و ﴿ويبغونها عوجا﴾ هەمیشە لەهەوڵیشدان کە ڕێگەو بەرنامەی خەڵکی لارو نەشیاو بێت ﴿وهم بالآخرة هم كافرون﴾ و باوەڕیشیان بەدوارۆژ نییە، ئەوانە کافرو بێ باوەڕن، بۆیە کاری وا دەکەن ﴿[٢٠] اولئك لم يكونوا معجزين فى الأرض﴾ خۆ ئەوانە کۆمەڵێکی وەهان هەرگیز ناتوانن لەم زەوییەدا لەدەستی دەرچن ﴿وما كان لهم من دون الله من اولياء﴾ و بێجگە لەخوایش هیچ دۆست و یارمەتییدەرێکیان دەس ناکەوێ لە سزا ڕزگاریان بکا ﴿يضاعف لهم العذاب﴾ سەرەڕای ئەوەش، بەپێی شێوازی کوفرەکەیان سزایان چەند بەرامبەر بۆ دەکرێ ﴿ماكانوا يستطيعون السمع وما كانوا يبصرون﴾ چونکە لەدونیادا ئەوەندە کینەو ڕقیان لەحەق بوو، نەیان ئەتوانی وشەی حەق ببیسن و، نەشیان ئەتوانی ببینن و ڕێ دەرکەن ، تائەمرۆ خۆ دەرباز بکەن ﴿[٢١] اولئك الذين خسروا انفسهم﴾ دیارە بەر لەهەموو شتێك، ئەوانە خۆیانیان دۆڕاندو زیانمەندبوون ﴿وضل عنهم ماكانوا يفترون﴾ ئەو پەرسراوانەش کە بەدرۆو پڕوپاڵانتە و، ناهەق دەیانپەرستن، لێیان بزر بوون و بەفیڕۆ چوون، واتە: هیچ کەڵك و سوودێکیان نەبوو بۆیان ﴿[٢٢] لاجرم انهم فى الآخرة هم الأخسرون﴾ جا هیچ گومانێکیش نییە کە لەدوا ڕۆژدا لە هەموو کەس دۆڕاوترو زیانمەندترن، چونکە بێ لە تاوانی خۆشیان، تاوانی خەڵکیشیان بەکۆڵەوەیەو، قیامەتیشیان بەدنیا فرۆشتووە. خوای گەورە لەدوا ڕۆژدا دنکە دنکە گوناحان بەمرۆڤە ئیماندارەکان دەناسێنێ و پێی لێدەنێن و، دەشزانن تیا دەچن، ئەوسا لەگەڵ ئەوەشدا خوا تاوانەکانیان دادەپۆشێ، بەڵام مرۆی کافرو دووڕوو: هەموو شایەتەکان نەحلەتیان لێدەکەن (فيقول الأشهاد هؤلاء الذين كذبوا على ربهم الا لعنة الله على الظالمين) موسلیم.

الجزء الثاني عشر　　سورة هود

أُوْلَٰٓئِكَ لَمْ يَكُونُواْ مُعْجِزِينَ فِي ٱلْأَرْضِ وَمَا كَانَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِنْ أَوْلِيَآءَۘ يُضَٰعَفُ لَهُمُ ٱلْعَذَابُۚ مَا كَانُواْ يَسْتَطِيعُونَ ٱلسَّمْعَ وَمَا كَانُواْ يُبْصِرُونَ ٢٠ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمْ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَفْتَرُونَ ٢١ لَا جَرَمَ أَنَّهُمْ فِي ٱلْأٓخِرَةِ هُمُ ٱلْأَخْسَرُونَ ٢٢ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَأَخْبَتُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّهِمْ أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ٢٣ ۞ مَثَلُ ٱلْفَرِيقَيْنِ كَٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْأَصَمِّ وَٱلْبَصِيرِ وَٱلسَّمِيعِۚ هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلًاۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ٢٤ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦٓ إِنِّي لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ٢٥ أَن لَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّا ٱللَّهَۖ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ أَلِيمٍ ٢٦ فَقَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوْمِهِۦ مَا نَرَىٰكَ إِلَّا بَشَرًا مِّثْلَنَا وَمَا نَرَىٰكَ ٱتَّبَعَكَ إِلَّا ٱلَّذِينَ هُمْ أَرَاذِلُنَا بَادِيَ ٱلرَّأْيِ وَمَا نَرَىٰ لَكُمْ عَلَيْنَا مِن فَضْلِۭ بَلْ نَظُنُّكُمْ كَٰذِبِينَ ٢٧ قَالَ يَٰقَوْمِ أَرَءَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّي وَءَاتَىٰنِي رَحْمَةً مِّنْ عِندِهِۦ فَعُمِّيَتْ عَلَيْكُمْ أَنُلْزِمُكُمُوهَا وَأَنتُمْ لَهَا كَٰرِهُونَ ٢٨

الحزب ٢٣

٢٢٤　　وَيَٰقَوْمِ لَآ

**پاداشی ئیمانداران لای خوا:**

﴿[٢٣] إن الذين آمنوا وعملوا الصالحات﴾ بێگومان ئەوانەش کە باوەڕیان هێناو، ئاکاری چاکیان ئەنجامدا
﴿واخبتوا إلى ربهم﴾ و لەراست پەروەردگاریان دڵیان داساکاو خۆیان بەکزو کەمدانا ﴿اولئك أصحاب الجنة﴾ ئەوانە
دەبنە خاوەنی بەهەشت و تێیدا نیشتەجێ دەبەن ﴿هم فيها خالدون﴾ بەهەتا هەتاییش لەوێ دەبن ﴿[٢٤] مثل الفريقين
كالأعمى والأصم والبصير والسميع﴾ مەسەل و نموونەی ئەودوو دەستەیە- مرۆڤی باوەڕدارو بێ باوەڕ- هەروەکو
مەسەلی کوێرو کەڕوو چاوساغ و بیسەرە, واتە: بێ باوەڕان هەموو نابیناو کەڕن، باوەڕدارانیش چاوساغ و ژنەوان
﴿هل يستويان مثلا﴾ دە ئاخۆ ئەو دوو دەستەیە وەك یەك وابن؟ ﴿افلا تذكرون﴾ دەسا بۆچی ئێوە بیرێ ناکەنەوەو
پەند وەرناگرن و لێکینادەنەوە، هەتا قازانج بەخۆتان بگەیەنن؟

**سەرگروشتەی نووح و نەتەوەکەی:**

﴿[٢٥] ولقد ارسلنا نوحا إلى قومه﴾ بەڕاستیی (نووح)مان ناردە لای قەوم و هۆزەکەی خۆی , دوای ئەوە
کەدونیایان پڕکردە ئاژاوەو خراپە کاریی ﴿إني لكم نذير مبين﴾ چووە لایان وپێی گوتن: بێگومان کەمن
ترسێنەرێکی ئاشکرام بۆتان ﴿[٢٦] الا تعبدوا إلا الله﴾ هاتووم پێتان بڵێم کە: بێجگە لەخوا هیچ کەس و شتێکی تر
مەپەرستن ﴿إني اخاف عليكم عذاب يوم اليم﴾ چونکە"ئەر بەگوێم نەکەن" دەترسم سزای ڕۆژێکی ئێش
پێگەیەنەرتان تووش ببێ ﴿[٢٧] فقال الملأ الذين كفروا من قومه﴾ کەچی گەورە گەورەو ناودارانی هۆزو گەلەکەی
نووح – ئەوانەیان خوا نەناس و بێ باوەڕبوون لەوەڵامی نووحدا- وتیان ﴿مانراك إلا بشرا مثلنا﴾ ئێمە تۆ وەکو
مرۆڤێکی ئاسایی ناوخۆمان دەبینین، واتە: وانازانین شایستەی پەیامبەرێتی بیت، هەتاقسەکانت ببیسین، چونکە
هیچ شتێکت لەئێمە زیاتر نییە ! ﴿وما نراك اتبعك إلا الذين هم أراذلنا بادى الرأى﴾ و دوا کەوتووەکانیشت هەر
ڕووتەو پووتەو(سەفیە)و بێ بیروئاوەزن دەبینین ﴿وما نرى لكم علينا من فضل﴾ ناشبینین هیچ پلەو پایەیەکی
زیادەتان بەسەر ئێمەدا هەبێت، تاشیاوی ئەوەبن ئێمە دواتان بکەوین ﴿بل نظنكم كاذبين﴾ بەڵکو گومان دەبەین
درۆزنن ، چ خۆت و چ هاوەڵانت !. دەسەڵاتداران وسەرانی چەواشە، غەیرەز خۆیان بە ڕووتەو پووتە دادەنێن و
پێیان دەڵێن: (هم أراذلنا بادى الرأى..) ! چونکە نافامن کەهەق و ڕاستیی بۆ هەرکەسێ دەرکەوت و پەیڕەویی
لێکرد، ئەو کەسە ڕاست و هەقدۆستە، نەك گێل و گەوج و نەزانەکانی لای ئەوان ﴿[٢٨] قال يا قوم أرأيتم إن كنت على
بينة من ربي﴾ نووح وتی: ئەی قەوم و هۆزم! ئەگەر بینیتان من بەڵگەو نیشانەیەکی ئاشکراو بەهێزم لەلایەن
پەروەردگارمەوە هەیە ﴿وآتاني منه رحمة من عنده﴾ و هەر لەلای خۆشیەوە ڕەحمەت و بەزەیەکی پێدابم، واتە:
پلەی پێغەمبەرێتی پێبەخشیبم ﴿فعميت عليكم﴾ و شاردرابێتەوە لە ئێوەو لێیتێنەگەن ، چونکە ئێوە شیاوی ئەو
نیعمەتە نین ﴿انلزمكموها﴾ دەکرێ ئێمە بەزۆر بیدەین بەسەرتاناو، برواتان پێبێنین ﴿وانتم لها كارهون﴾ و ئێوەیش
حەزی لێنەکەن و نەتانەوێ، بێگومان هەرگیز ئێمە بەزۆر باوەڕ بەکەس ناهێنین ﴿[٢٩] ويا قوم لا أسألكم عليه مالا﴾
ئەی قەوم و هۆزی من ! بزانن کەمن لەبەرامبەر گەیاندنی ئەم ئامۆژگاریی و بەرنامەیەم، هیچ مزەو پاداشێکم لەئێوە
ناوێ ، هەتا لاتان قورس بێ و بۆتان نەدرێت ﴿إن اجرى إلا على الله﴾ چونکە پاداش و مزەی من هەر لەسەر خوایەو
هەر لەومدەوێ ﴿وما انا بطارد الذين آمنوا﴾ هەرگیزیش ئەوانە باوەڕیان هێناوە لەبەر قسەی ئێوە تاریان نانێم و
دووریان ناخەمەوە، دیارە ئەوان داوایانکردبوو کە: بروادارەکان لەکۆڕو دانیشتنەکانیدا وەدەرنێ، ئەوسا دێنە لای،
هەروەکو قورەیش هەمان داخوازییان لە پێغەمبەر هەبوو!﴿إنهم ملاقوا ربهم﴾ چونکە بێگومان ئەوان لەقیامەتدا

لەگەڵ پەروەردگاری خۆیان دیدەن دەکەن و شکایەتی من دەکەن لەلای ئەو ﴿ولكني اراكم قوما تجهلون﴾ بەڵام-
راستییەکەی- من ئێوە بەهۆزو گەلێکی نەفام و نەزان دەبینم، ئەگینە چۆن داوای دەرکردنی ئەوئیمانداره
هەژارانەتان دەکرد و، بەگێله پیاوو نەزانتان دەزانین! ﴿٣٠ ويا قوم من ينصرني من الله إن طردتهم﴾ ئەی قەوم و
هۆزی من! چ کەسێ دەتوانێ یارمەتیم بداو لەسزای خوا رزگارم بکا ئەگەر ئەو ئیماندارانەم دوور خستەوەو دەرم
کردن؟ ﴿افلا تذكرون﴾ ئاخۆ هیچ بیر ناکەنەوە" کەچەندە تاوانە دەرکردنیان" ﴿٣١ ولا اقول لكم عندي خزائن الله﴾
من هەر لەبەر ئەوە پێغەمبەرم ناڵێم گەنجینەو خەزێنەی خوا لای منەو، گەنجینەداری خوام ، تا ئەوەی شوێنم
دەکەوێ دەوڵەمەندی بکەم ﴿ولا اعلم الغيب﴾ ناشڵێم من ئاگام لە نادیارو شتی غەیبییە ﴿ولا اقول إني ملك﴾ و
ناشڵێم من فریشتەیەکم، نێردراوم بۆلاتان تا بەدرۆزنم بزانن
﴿ولا اقول للذين تزدري اعينكم﴾ وناشڵێم بەو ئیماندارانەی
کە لەبەرچاوی ئێوە سووک و بێ نرخن ﴿لن يؤتيهم الله
خيرا﴾ کە خوا هەرگیز خێرو چاکەیان لەگەڵ ناکاو لەسەر
رێی راست نین، وەك ئێوە پێتان وایە ﴿الله اعلم بما في
انفسهم﴾ خوا خۆی چاکدەزانێ چی لەدڵ و دەروونیاندایەو،
پاداش و تۆڵەشیان هەر بەپێی ئەوەی دڵیان دەداتەوە ﴿إني
إذا لمن الظالمين﴾ ئەگەر من ئەوە بکەم کەئێوە دەیڵێن،
بەراستیی بێگومان دەچمە ریزی ستەمکارانەوە .

**قەومەکەی نووح سزا دەخوازن:**

﴿٣٢ قالوا يانوح﴾ وتیان ئەی نووح ! ﴿قد جادلتنا
فأكثرت جدالنا﴾ بەراستیی شەڕەقسەو دەمەقاڵێی زۆرت
لەگەڵ کردین و زۆریش لەسەری رۆیشتی، دەسا لەگەڵ
ئەوەشدا زۆر بەچاکی بزانە کە ئێمە هەرگیز دوای خۆت و
بەرنامەت ناکەوین ﴿فأتنا بما تعدنا إن كنت من الصادقين﴾
دەسا ئەر تۆ دەتوانیی و لە راستگۆیانیت ، ئەو سزایەمان بۆ
بهێنە بەڵێمان پێدەدەیت ﴿٣٣ قال إنما يأتيكم به الله إن
شاء﴾ نوح وتی: بەراستیی هێنانی ئەو سزایە هەر بەدەستی خوایەو، هەرئەویش دەتوانێت بیهێنێ بۆتان ئەر
ویستی ﴿وما انتم بمعجزين﴾ کەهێنایشی ئیتر ئێوە ناتوانن بەرهەڵستی بکەن و، دەستەوسان بیوەستێنن ﴿٣٤ ولا
ينفعكم نصحي إن اردت أن أنصح لكم إن كان الله يريد أن يغويكم﴾ خۆئەگەر خوا بییەوێ گومراشتان بکاو رێتان
لێتێك بدا، ئیتر من هەرچەند ئامۆژگارییتان بکەم بۆ سوودو کەڵکی ئێوە ، سوودو کەڵکی نابێ بۆتان، چونکە خوا
خۆی دەیەوێ گومرابن ، دیارە کەئیتر هەرگیز ناتوانن لە ئیرادەی ئەو دەرچن ﴿هو ربكم﴾ هەر ئەویشە
پەروەردگارتان ﴿وإليه ترجعون﴾ و هەر بۆلای خۆیشی دەچنەوەو، حیساب و لێکۆڵینەوەتان لەگەڵدەکات ﴿٣٥ ام
يقولون افتراه﴾ یان دەڵێن: موحەممەد ﷺ خۆی ئەم چیرۆکەی هەڵبەستووەو دەیداتە پاڵ خوا! ئەوساش باوەڕ
بەداستانی گەلەکەی (نووح) ناکەن ﴿قل إن افتريته﴾ ئەی موحەممەد! بڵێ: ئەگەر وابێ کەئێوە ئەیڵێن و من خۆم

الجزء الثاني عشر — سورة هود

وَيَٰقَوۡمِ لَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مَالًاۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِۚ وَمَآ
أَنَا۠ بِطَارِدِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْۚ إِنَّهُم مُّلَٰقُواْ رَبِّهِمۡ وَلَٰكِنِّيٓ أَرَىٰكُمۡ
قَوۡمٗا تَجۡهَلُونَ ﴿٢٩﴾ وَيَٰقَوۡمِ مَن يَنصُرُنِي مِنَ ٱللَّهِ إِن طَرَدتُّهُمۡۚ
أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٣٠﴾ وَلَآ أَقُولُ لَكُمۡ عِندِي خَزَآئِنُ ٱللَّهِ وَلَآ
أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ وَلَآ أَقُولُ إِنِّي مَلَكٞ وَلَآ أَقُولُ لِلَّذِينَ تَزۡدَرِيٓ
أَعۡيُنُكُمۡ لَن يُؤۡتِيَهُمُ ٱللَّهُ خَيۡرًاۖ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا فِيٓ أَنفُسِهِمۡ إِنِّيٓ إِذٗا
لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٣١﴾ قَالُواْ يَٰنُوحُ قَدۡ جَٰدَلۡتَنَا فَأَكۡثَرۡتَ
جِدَٰلَنَا فَأۡتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٣٢﴾ قَالَ
إِنَّمَا يَأۡتِيكُم بِهِ ٱللَّهُ إِن شَآءَ وَمَآ أَنتُم بِمُعۡجِزِينَ ﴿٣٣﴾ وَلَا يَنفَعُكُمۡ
نُصۡحِيٓ إِنۡ أَرَدتُّ أَنۡ أَنصَحَ لَكُمۡ إِن كَانَ ٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يُغۡوِيَكُمۡۚ
هُوَ رَبُّكُمۡ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴿٣٤﴾ أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰهُۖ
قُلۡ إِنِ ٱفۡتَرَيۡتُهُۥ فَعَلَيَّ إِجۡرَامِي وَأَنَا۠ بَرِيٓءٞ مِّمَّا تُجۡرِمُونَ ﴿٣٥﴾
وَأُوحِيَ إِلَىٰ نُوحٍ أَنَّهُۥ لَن يُؤۡمِنَ مِن قَوۡمِكَ إِلَّا مَن قَدۡ ءَامَنَ
فَلَا تَبۡتَئِسۡ بِمَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ﴿٣٦﴾ وَٱصۡنَعِ ٱلۡفُلۡكَ بِأَعۡيُنِنَا
وَوَحۡيِنَا وَلَا تُخَٰطِبۡنِي فِي ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ إِنَّهُم مُّغۡرَقُونَ ﴿٣٧﴾

٢٢٥

هەڵم بەستبێ ﴿فعلي إجرامي﴾ دیارە گوناح و تاوانەکەی هەردەکەوێتە سەرخۆم ، ئێوە بەرپرس نین ، وە ئەگەر راستگۆبم, ئەوە ئێوە تاوانبارن ﴿وأنا برئ مما تجرمون﴾ و منیش لەهەر تاوانێ ئێوە دەیکەن بەرێ و بێزارم، واتە: کەس تۆڵەی کەس نادرێ بەسەریا. پاش ئەوە کەنووح بۆی دەرکەوت ئەوانە ئیمان ناهێنن ، تووڕەبوو لێیان ودوعای لێکردن وفەرمووی:(رب لاتذر على الأرض من الكافرين ديارا) نووح/٢٦) خوایش فەرمووی: ئەم ئایەتی (٣٥)ــە رستەیەکی تێهەڵکێشە لەنێوان داستانەکەی نووحدا عليه السلام تاپێغەمبەر ﷺ یەکسەرە ئازارو بێزارەکەی قوڕەیش وە بیر بێنێ و، بزانێ لەبەرئەوە کە پێغەمبەرانی بەرلەخۆیشی هەر لەو سزایەدا بوون، دەبێ ئەمیش بەئارامتر بێ لەوان ﴿[٣٦] وأوحي إلى نوح﴾ بە نووح وەحیی و سروشکرا پاش ئەوە گوتی: (..إني مغلوب فانتصر ١٠/٥٤ ﴿أنه لن يؤمن من قومك إلا من قد آمن﴾ دەبێ چاکبزانیت کە جگە لەوانە لەمەو بەر بڕوایان هێناوە، ئیتر کەسێکی دی لە هۆزەکەت باوەڕ ناهێنێ ﴿فلا تبتئس بما كانوا يفعلون﴾کەوابوو لەو کارانە دەیکەن خەفەتبار مەبە، چونکە دەرەنجام تۆ رزگارئەبی و، ئەوان تیا دەچن .

**نووح لەچارەنووسی قەومەکەی حاڵی بوو:**

﴿[٣٧] واصنع الفلك بأعيننا ووحينا﴾ دەبێ لەبەرچاو خۆمانەوەو بەپێی سروش و فەرمانی خۆمان کەشتیەك دروست بکەیت و خەڵکە موسڵمانەکەی سوار بکەیت ﴿ولا تخاطبني في الذين ظلموا﴾ و ئیتر لەمەڕ ئەوانەوە ستەمیانکردووە لێم مەپاڕێوە" بۆ رزگاربوون و لەناو نەچوونیان "﴿إنهم مغرقون﴾ چونکە بەراستیی بڕیار دراوە کە دەبێ ئەوانە نقوم بن وبخنکێن ، واتە: کار لەکار ترازاوەو قسەی پێناوێ ﴿[٣٨] ويصنع الفلك﴾ نووحیش دەستیدایە دروستکردنی کەشتییەکە" بە پێی نەخشەو فەرمانەکەی خوا، ئیتر چۆن و لەچیی و ئەندازەکەی چەندبوو؟ بۆ وەڵامی ئەمە ریوایەت زۆرە، بەڵام گەلێ لەو



وَيَصۡنَعُ ٱلۡفُلۡكَ وَكُلَّمَا مَرَّ عَلَيۡهِ مَلَأٞ مِّن قَوۡمِهِۦ سَخِرُواْ
مِنۡهُۚ قَالَ إِن تَسۡخَرُواْ مِنَّا فَإِنَّا نَسۡخَرُ مِنكُمۡ كَمَا تَسۡخَرُونَ ﴿٣٨﴾
فَسَوۡفَ تَعۡلَمُونَ مَن يَأۡتِيهِ عَذَابٞ يُخۡزِيهِ وَيَحِلُّ عَلَيۡهِ عَذَابٞ
مُّقِيمٌ ﴿٣٩﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَمۡرُنَا وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ قُلۡنَا ٱحۡمِلۡ فِيهَا
مِن كُلّٖ زَوۡجَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِ وَأَهۡلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيۡهِ ٱلۡقَوۡلُ
وَمَنۡ ءَامَنَۚ وَمَآ ءَامَنَ مَعَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلٞ ﴿٤٠﴾ ۞وَقَالَ ٱرۡكَبُواْ
فِيهَا بِسۡمِ ٱللَّهِ مَجۡرٜىٰهَا وَمُرۡسَىٰهَآۚ إِنَّ رَبِّي لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٤١﴾ وَهِيَ
تَجۡرِي بِهِمۡ فِي مَوۡجٖ كَٱلۡجِبَالِ وَنَادَىٰ نُوحٌ ٱبۡنَهُۥ وَكَانَ
فِي مَعۡزِلٖ يَٰبُنَيَّ ٱرۡكَب مَّعَنَا وَلَا تَكُن مَّعَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٤٢﴾
قَالَ سَـَٔاوِيٓ إِلَىٰ جَبَلٖ يَعۡصِمُنِي مِنَ ٱلۡمَآءِۚ قَالَ لَا عَاصِمَ
ٱلۡيَوۡمَ مِنۡ أَمۡرِ ٱللَّهِ إِلَّا مَن رَّحِمَۚ وَحَالَ بَيۡنَهُمَا ٱلۡمَوۡجُ فَكَانَ
مِنَ ٱلۡمُغۡرَقِينَ ﴿٤٣﴾ وَقِيلَ يَٰٓأَرۡضُ ٱبۡلَعِي مَآءَكِ وَيَٰسَمَآءُ
أَقۡلِعِي وَغِيضَ ٱلۡمَآءُ وَقُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ وَٱسۡتَوَتۡ عَلَى ٱلۡجُودِيِّۖ وَقِيلَ
بُعۡدٗا لِّلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾ وَنَادَىٰ نُوحٞ رَّبَّهُۥ فَقَالَ رَبِّ إِنَّ
ٱبۡنِي مِنۡ أَهۡلِي وَإِنَّ وَعۡدَكَ ٱلۡحَقُّ وَأَنتَ أَحۡكَمُ ٱلۡحَٰكِمِينَ ﴿٤٥﴾



وەڵامانە بناغەو بنەمایەکیان نییە، ئەوە نەبێت کەخوای کار جوان لەسوورەتی (قەمەر)دا باسیان دەکا ﴿وكلما مر عليه ملأ من قومه﴾ هەرکە کۆمەڵێ لە سەردارانی هۆزەکەی بەلایدا دەرۆشتن ﴿سخروا منه﴾ گاڵتەیان پێدەکردو دەیانگوت:"های! های! دوێنێ پەیامبەر بوویت و، ئەمرۆ بوویتە دارتاش!" ﴿قال إن تسخروا منا﴾ نووح وتی: ئەگەر ئێوە ئەمرۆ گاڵتە بەئێمە بکەن ﴿فإنا نسخر منكم كما تسخرون﴾ ئەوا ئێمەیش لەکاتی نقومبونەکەدا " کەسەرەنجامی ئێوەیە" گاڵتە بەئێوەدەکەین، هەروەکو ئێوە ئەمرۆ گاڵتەو لاقرتی بەئێمە دەکەن ﴿[٣٩] فسوف تعلمون﴾ لەمەو دواش چاکدەزانن "پاشەڕۆژ چۆن دەبێ و بۆکێ دەبێ" ﴿من يأتيه عذاب يخزيه﴾ و کێش سزایەکی بۆ دەبێ ئابڕووی بەرێ ﴿ويحل عليه عذاب مقيم﴾ و لە قیامەتیشدا سزایەکی هەتا هەتایی ولەبن نەهاتووی خوا دەکەوێتە سەری ولەکۆڵی نابێتەوە ﴿[٤٠] حتى إذا جاء امرنا وفار التنور﴾ ئەو حاڵەتەیان هەر بەردەوام بوو هەتا

ئەوكاتە كە بڕیاری پیادەكرنی سزاكەمان گەیی، نیشانەیشی ئەوە بوو كە: ئاویش لەڕووی زەویی لەهەموو لایەكەوە هەڵقوڵێ, تەنانەتی لە (تەنوورە) كانیشیانەوە كە جێگەی ئاگری ئەوانە، بەڵام (ئیبن عەبباس) ئەڵێت: (التنور: وجه الأرض، وقال الطبري: والعرب تسمى وجه الأرض تنور الأرض) واتە: بە رووی گشت زەوی دەڵێن: تەنوور، مەبەست ئەوەیە كەهەركات دیتتان لەگشت لایەكەوە ئاو هەڵقوڵیی و كەوتە سەر زەویی, ئەوە ئیتر كاتی سزاكە هاتووە ﴿قلنا احمل فيها من كل زوجين اثنين﴾ ئەوسا بە(نووح)مان گوت: لەهەر نێرو مێیەكی گیانلەبەران ، دوان لەكەشتییەكەدا هەڵگرە ﴿وأهلك إلا من سبق عليه القول﴾ هەروا خانەوادەكەت سوار بكە, مەگەر كەسێك كەهەر لە زووەوە- بەهۆی لاساریی خۆیەوە- بڕیاری تیاچوونی بۆ درابێ، وەكو(كەنعان)ی كوڕت و، (واعیلە)ی خێزانت، ئەمانە بەهۆی بێ باوەڕی خۆیانەوە، دەبێ لەگەڵ ئەواندا تیابچن ﴿ومن آمن﴾ وەهەر كەسێكی دیكەش باوەڕی هینابێ هەڵیگرە ﴿وما آمن معه إلا قليل﴾ خۆ ژمارەیەكی كەمیش نەبێت لەگەڵیا بڕوایان نەهینا، (ئیبن عەباس) ئەڵێت: لەگەڵ ئەوەیشدا كە نووح (٩٥٠) ساڵ لە ناویاندا بوو، تەنها (٨٠) كەسێك باوەڕی هێنا پێی!.

**ئیماندارەكان چوونە گەمیەكەوەو بەناوی خوا حەرەكەتی كرد:**

﴿[41] وقال اركبوا فيها بسم الله مجريها ومرسيها﴾ ئەوسا (نووح) بەسەر نشینی گەمیەكەی وت: دەسا سواری ببن و لە چوونی و لەوەستانیدا هەر بەناوی خواوە ﴿إن ربي لغفور رحيم﴾ چونكە بەڕاستیی پەروەردگارم زۆر لیبوردەیە، زۆریش دلۆڤان و میهرەبانە بەرامبەر بەئیمەی باوەڕدارو لەم بەلایە لامان دەدات ﴿[42] وهي تجري بهم في موج كالجبال﴾ ئینجا كەشتییەكە بەناو شەپۆلی وادا دەیبردن وەك چیاكان بوو, واتە: لە بڵندیی و گەورەیی و شێوەیاندا ﴿ونادى نوح ابنه وكان في معزل﴾ و (نووح)یش بانگی لە كوڕەكەی كرد, كە لەشوێنێكی چەپەك بوو ﴿يا بني اركب معنا﴾ ئەی كوڕە چكۆڵەكەم ! وەرە لەگەڵمان سواربەو خۆت لەئێمە مەبوێرە ﴿ولا تكن من الكافرين﴾ و لەكافرو بێ باوەڕان مەبە بەئاییینی خوا.

**زەریانەكە كۆتایی دێو كوڕەكەی نووح دەخنكێ:**

﴿[43] قال سآوي إلى جبل يعصمني من الماء﴾ كوڕەكەی نووح لەوەلامی بابیا وتی: پەنا دەبەمە لای ئەو چیایە كە لەئاوو تۆفانەكە دەمپارێزێ وناخنكێم ﴿قال لاعاصم اليوم من أمرالله إلا من رحم﴾ نوح وتی: ئەمڕۆ هیچ پارێزەرێك بۆ هیچ كەسێك نیە لە بەرامبەر دەسەلات و فەرمانی خواوە، مەگەر كەسێك كە خوای بەبەزەیی روحمی پێ بكات ﴿و حال بينهما الموج فكان من المغرقين﴾ ئا لەوقسەو باسەدا بوون كتوپڕ شەپۆلی دەریاكە كەوتە نێوانیان و, بۆخۆی چووە ڕیزی نوقوومكراوو خنكاوەكانەوە ﴿[44] وقيل ياأرض ابلعي ماءك﴾ و دوای تیاچوونی گەلە لاسارەكەی نووح لەلایەن خواوە، وترا: ئەی زەویی! ئادەی ئاوەكەی سەرت هەڵ لووشەو بیكەوە ناو زكی خۆتەوە ﴿ويا سماء اقلعي﴾ تۆیش ئەی ئاسمان! دەست بەرداربە لەئاو ڕژاندن و, باران مەبارێنە ﴿وغيض الماء وقضى الأمر﴾ خێرا ئاوەكە كەم بوویەوەو دادەڵییە ناو ناخی زەویی و، بڕیارو و فەرمانەكەی خواش بەتیاچوونی گەلەكەی نووح جێبەجێ كرا ﴿واستوت على الجودي﴾ وكەشتییەكەش لەسەر كێوی جودیی وەستاو لەنگەری گرت.

چیای جوودیی: دەكەوێتە نزیك شاری موسڵ, لە كوردستانی عێراق و، باكوری توركیاوە، ، ئێستاش بەم ناوانەیشەوە ناوبانگی هەیە: (ئارارات، هەراوراد، بەخشەندە، جودیی، گودیی، كوردیی، كردین) ﴿وقيل بعدا للقوم الظالمين﴾ پاشان گوترا: دەبا ئەو گەلە ستەمكارەیە لە بەزیی خواوە دووربێ .

**نووح بۆ کوڕەکەی هاواری لێ بەرزەوە بوو:**

﴿٤٥ **ونادى نوح ربه**﴾ ئەوسا نووح سۆزی باوکایەتی جوڵاندیی و هاواری لەپەروەردگاری خۆیکرد ﴿**فقال إن ابني من أهلي**﴾ وتی: ئەی پەروەردگارم! بەڕاستیی کوڕەکەم تاکێکی خێزانەکەمە, تۆیش بەڵێنت پێدام کەخێزانەکەم ڕزگار بکەیت ﴿**وإن وعدك الحق**﴾ و گومانیش نییە کەبەڵێنی تۆ ڕاست و هەقە" جا بەڵکو ئەویشم بۆ ڕزگار بکەیت " ﴿**وأنت أحكم الحاكمين**﴾ تۆش لە هەموو فەرمانڕەواکان دادپەروەر تری، چونکە لەوان زاناتری ﴿٤٦ **قال يا نوح إنه ليس من أهلك**﴾ خوا فەرمووی: ئەی نووح! ئەو کوڕە لەخێزانی تۆ نییە, واتە: لەو خێزانە نیە بەڵێنم دایتێ ڕزگاری بکەم ﴿**إنه عمل غير صالح**﴾ چونکە مرۆڤێکی لاسارو وخراپکارە ﴿**فلا تسألني ماليس لك به علم**﴾ دەسا تۆش داوای شتێکم لێ مەکە هیچ زانستێکت پێی نییەو هیچی لێ نازانیت ﴿**إني اعظك ان تكون من الجاهلين**﴾ ئامۆژگارییت دەکەم کە: کارێ نەکەیت خۆت ببەیتە ڕیزی نەزان و گوناحکارانەوە.

الجزء الثاني عشر — سُورَةُ هُودٍ

قَالَ يَٰنُوحُ إِنَّهُۥ لَيْسَ مِنْ أَهْلِكَ ۖ إِنَّهُۥ عَمَلٌ غَيْرُ صَٰلِحٍ ۖ فَلَا تَسْـَٔلْنِ
مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۖ إِنِّىٓ أَعِظُكَ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٤٦﴾
قَالَ رَبِّ إِنِّىٓ أَعُوذُ بِكَ أَنْ أَسْـَٔلَكَ مَا لَيْسَ لِى بِهِۦ عِلْمٌ ۖ وَإِلَّا
تَغْفِرْ لِى وَتَرْحَمْنِىٓ أَكُن مِّنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٤٧﴾ قِيلَ يَٰنُوحُ
ٱهْبِطْ بِسَلَٰمٍ مِّنَّا وَبَرَكَٰتٍ عَلَيْكَ وَعَلَىٰٓ أُمَمٍ مِّمَّن مَّعَكَ ۚ
وَأُمَمٌ سَنُمَتِّعُهُمْ ثُمَّ يَمَسُّهُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٤٨﴾ تِلْكَ
مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْغَيْبِ نُوحِيهَآ إِلَيْكَ ۖ مَا كُنتَ تَعْلَمُهَآ أَنتَ وَلَا قَوْمُكَ
مِن قَبْلِ هَٰذَا ۖ فَٱصْبِرْ ۖ إِنَّ ٱلْعَٰقِبَةَ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٤٩﴾ وَإِلَىٰ عَادٍ
أَخَاهُمْ هُودًا ۚ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ
غَيْرُهُۥٓ ۖ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا مُفْتَرُونَ ﴿٥٠﴾ يَٰقَوْمِ لَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ
أَجْرًا ۖ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَى ٱلَّذِى فَطَرَنِىٓ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٥١﴾
وَيَٰقَوْمِ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوٓا۟ إِلَيْهِ يُرْسِلِ ٱلسَّمَآءَ
عَلَيْكُم مِّدْرَارًا وَيَزِدْكُمْ قُوَّةً إِلَىٰ قُوَّتِكُمْ وَلَا تَتَوَلَّوْا۟
مُجْرِمِينَ ﴿٥٢﴾ قَالُوا۟ يَٰهُودُ مَا جِئْتَنَا بِبَيِّنَةٍ وَمَا نَحْنُ
بِتَارِكِىٓ ءَالِهَتِنَا عَن قَوْلِكَ وَمَا نَحْنُ لَكَ بِمُؤْمِنِينَ ﴿٥٣﴾

٢٢٧

**تێبینی:** بۆ زانینی ژمارەی سەرنشینی گەمییەکەو، چەند ڕۆژ تێیدا مانەوەو، تۆفانەکە گشتگیر بووبێ یان نا؟ ئەمانەو چەندین قسەی تر لەوبارەوە هەن، هەموو دەدەینە دەستی خواو، لێی بێدەنگ دەبین، ئەگەرچی پێشەوا (ئەحمەد) -خوای لێی ڕازی بێت- ئەم فەرموودەیە دێنی و دەڵێت: ((عن أبي هريرة ﷺ قال: مر النبي ﷺ بأناس من اليهود، وقد صاموا يوم عاشوراء، فقال: ما هذا من الصوم ؟ قالوا: هذا اليوم الذي نجى الله موسى وبني إسرائيل من الغرق وغرق فيه فرعون، وهذا يوم استوت فيه السفينة على الجودي، فصامه نوح وموسى عليهما السلام شكرا لله (عز وجل) فقال النبي ﷺ: انا أحق بموسى، وأحق بصوم هذا اليوم، فصام، وقال لأصحابه: من كان منكم أصبح صائما فليتم صومه، ومن كان أصاب من غداء أهله فليتم بقية يومه)) مسند الإمام أحمد ٣٥٩/٢-٣٦٠. جا بەپێی ئەم فەرموودەیە وا دەردەکەوێ دابەزینیان لە کەشتییەکە، ڕۆژی (١٠)ی مانگی موحەڕەم بووبێ. ﴿٤٧ **قال ربي اعوذ بك ان أسألك ما ليس لي به علم**﴾ ئینجا نوح پەشیمان بووەوەو بەپەلە گەڕایەوە لای خواو وتی: ئەی پەروەردگارم! پەنات پێدەگرم کە: جارێکی تر داوای هەر شتێکت لێبکەم کە زانیاریم پێی نەبێ ﴿**والا تغفر لي وترحمني اكن من الخاسرين**﴾ ئێستاش ئەرتۆ لێمخۆش نەبی و بەزەییت پێما نەیەتەوە، لە زیانمەندان دەبم ﴿٤٨ **قيل يا نوح اهبط بسلام منا وبركات عليك وعلى امم ممن معك**﴾ ئیتر میهرەبانی خوای بە بەزەیی فریایکەوت و پێگوترا: ئەی نووح ! بەسەلامەتی و بەئاسوودەیی و، بەپیرۆزی لە ئێمەوە بۆخۆت و بۆ ئەو ئوممەتانەی لە گەڵتن لەچیای جوودیی وەرە خوارێ بۆ دەشتایی ﴿**وامم سنمتعهم**﴾ ئەو ئوممەت و خەڵکانەیش

دواییدێن، تاماوەیەك دەیان ژێنین ﴿ثم یمسهم منا عذاب الیم﴾ پاشان لەئێمەوە تووشی سزایەکی ئێش پێگەیەنەر دەبن، ئەگەر لاروو لاسار دەر بچن.

**ئەم داستانە بەڵگەی راستیی قورئانە :**

﴿[٤٩] تلك من انباء الغیب﴾ ئەم هەواڵ و دەنگ و باسە بۆم باسکردیت، بەشێکە لەوهەواڵە نادیارانە ﴿نوحیها إلیك﴾ خۆمان بەوەحیی پێت رادەگەیەنین -ئەی پێغەمبەر! ﷺ ﴿ما کنت تعلمها أنت ولا قومك من قبل هذا﴾ نە تۆ دەتزانی بەرلەهاتنی ئەم قورئانە تۆفان بووە، نە نەتەوەکەیشت دەیزانی ﴿فاصبر إن العاقبة للمتقین﴾ جاتۆش (ئەی پێغەمبەر! ﷺ) بەرامبەر بەهەموو پێشهاتەکان خۆڕاگرو بە ئارامبە ، وەکو نووح ﵇ بەئارام و خۆڕاگربوو، چونکە بەڕاستیی پاشەڕۆژی رووناك و، سەر فرازیی بۆ خۆپارێزارانە لەشیرك و تاوان.

**هوودو عادی قەومی :**

﴿[٥٠] وإلى عاد اخاهم هودا﴾ بۆلای قەومی (عاد)یش (هوود) برایمان نارد، واتە: هەر لەخۆیان بوو، وەکو (نووح)مان ناردە لای قەومەکەی خۆی ﴿قال یا قوم اعبدوا الله ما لکم من إله غیره﴾ پێیگوتن: ئەی هۆزو گەلم! دەبێ هەر ئەوخوا تاكو تەنیایە بپەرستن، چونکە جگە لەو هیچ پەرستراوێکی تری راستەقینە شکنابەم بۆتان ﴿إن انتم إلا مفترون﴾ ئێوە هەردرۆ هەڵدەبەستن لە ئیدیعاکردنتان کەخوا شەریکی هەبێ لە پەرستندا، ئەگینە خوا هەر ئەو تاکە خوایەیەو هاوبەشی نییە لە پەرستندا ﴿[٥١] یا قوم لا أسألکم علیه اجرا﴾ ئەی هۆزی من! خۆ لەبەرامبەر گەیاندنی بەرنامەکەی خوادا، من هیچ پاداش و کرێیەکم لێتان ناوێ، هەتا لەسەرشانتان سەخت بێت ﴿إن اجری إلا على الذی فطرنی﴾ کرێ و پاداشی من هەر لەسەر ئەو زاتەیە بەدیهێناوم ﴿افلا تعقلون﴾ ئاخۆ هۆش و بیرناکەنەوە، ژیر نابن ﴿[٥٢] ویا قوم استغفروا ربکم﴾ -ئەی خزم و گەلەکەم ! لەپەروەردگارتان داوای لێبوردن و پۆشینی گوناح بکەن ﴿ثم توبوا إلیه﴾ پاشانیش تەوبە بکەن و بێنەوە بۆلای ﴿یرسل السماء علیکم مدرارا﴾ ئەویش لەئاسمانەوە بەلێزمەو خوڕەم، بارانتان بۆ دەبارێنێ ﴿ویزدکم قوة إلى قوتکم﴾ و هێزیکی تر دەدا بەهێزو تواناتان زیاد لەهێزی خۆتان کەپێی بایی ببوون ﴿ولا تتولوا مجرمین﴾ وە ئێوە بەتاوان ڕوو وەر مەچەرخێنن لەوەی بانگتان دەکەن بۆی، واتە: بەشکو لە گوناح وەگەڕێن و تەوبە بکەن، وەکو پەیامبەر ﷺ لە فەرموودەیەکدا- ئەبوداود، ئیبن ماجە ریوایەتی دەکەن- دەفەرموێ: ((من لزم الإستغفار جعل الله له من کل هم فرجا، ومن کل ضیق مخرجا، ورزقه من حیث لا یحتسب)).واتە: ئەو کەسەی کەهەمیشە خوای لەیادەو داوای لێبوردنی لێدەکا، دڵنیابێ بۆ گشت خەم و خەفەتێك خوا دەرووی لێدەکاتەوە، وە لەگشت تەنگانەیەك دەرگای خێری بۆ واڵا دەکاو، رزق و ڕۆزیەکی وایدەداتێ، خۆیشی بەبیریا نەیەت.

**ئاخافتنێکی نێوان هوودو قەومەکەی:**

﴿[٥٣] قالوا یا هود ما جئتنا ببینة﴾ وتیان: ئەی هوود! تۆ بەڵگەیەکی رۆشنی وات بۆ نەهێناوین، ببێتە نیشانەی راستیت ، تا ئێمەش باوەڕ بکەین تۆ پێغەمبەری خوایت ﴿وما نحن بتارکی آلهتنا عن قولك﴾ چاکیش بزانە هەرگیز ئێمە لەبەرقسەی تۆ واز لەخواکانی خۆمان ناهێنین ﴿وما نحن لك بمؤمنین﴾ و قەتیش باوەڕت پێناکەین، وە لەسەر قسەی خۆیمان سوورین ﴿[٥٤] إن نقول إلا اعتراك بعض آلهتنا بسوء﴾ و هەر ئەمەندەش دەڵێین کەهەندێ لەخواکانمان دەستیان لێ وەشاندویت، سەرت لێ تێکچووە، چونکە بەخراپە ناویان دەبەیت ﴿قال إنی اشهد الله﴾ هود وتی: بێگومان من خوا بەشایەت دەگرم ﴿واشهدوا انی بریء مما تشرکون﴾ و ئێوەیش بەشایەت بن

كە: بەڕاستیی من لەو بتانە ئێوە دەیانكەنە هاوبەشی خواو ئەیانپەرستن بەریی و بێزارم ﴿[٥٥] من دونه فكیدونی جمیعا﴾ بێگومانم كە جگە لەخوا" پەرستنی هیچ شتێكی تر ڕەوا نییە، سا (ئێوەو بتەكانتان) كۆ ببنەوەو چەندە دەتوانن نەخشە بكێشن بۆ لەناوبردنم ﴿ثم لا تنظرون﴾ لەپاشانیش هیچ مەوداو مۆڵەتیشم مەدەن ئەگەر ئەتوانن" ئەوسا چاك بزانن كەهێمان لەوكاتەیشدا من هیچ باكێكم نییە ﴿[٥٦] إنی توكلت علی الله ربی وربكم﴾ چونكە بێگومان من پاڵم بەو خواوە داوە، كە پەروەردگاری من و، ئێوەیشە ، واتە: هەر بەبڕیاری ئەو ڕازیم و، متمانەشم تەنها بەیارمەتیی و پشتیوانی ئەوە ﴿ما من دابة إلا هو آخذ بناصیتها﴾ هیچ دەعباو ڕەوكەرێك نیە مەگەر خوا پێشەسەری گرتووە، واتە: هەر ئەو خاوەنیەتی و هەموو شتێكی بەدەست ئەوەو لە ژێر دەسەڵاتی ئەودایە ﴿إن ربی علی صراط مستقیم﴾ بەڕاستیی پەروەردگارم لەسەر هەق و ڕاستە ڕێیە، واتە: نەخشەو پلانەكانی گشت پڕ لەدادن، ستەم لەكەس ناكاو، حەزدەكا هەموو بەرەو هەق بێن.

**گەلی( عاد ) تیاچوو بەدەر لەئیماندارەكانیان:**

﴿[٥٧] فإن تولوا فقد ابلغتكم ما ارسلت به إلیكم﴾ جائەر ئێوە لەداخوازییەكەم ڕوو وەردەچەرخێنن و، گوێ ناگرن بۆم، وامن ڕاسپاردەی خۆمم پێڕاگەیاندن و، ئەنجامی لاڕی بوونیشم بۆ ڕوونكردنەوە ﴿ویستخلف ربی قوما غیركم﴾ و پەروەردگاریشم لەناوتان دەباو لەجیاتی ئێوە خەڵكێكی تر دادەنێ كەئەوان بەڕاستیی و ئیخلاسەوە ئەیپەرستن ﴿ولا تضرونه شیئا﴾ ناشتوانن هیچ زیانێكی پێبگەیەنن ﴿إن ربی علی كل شئ حفیظ﴾ بەڕاستیی پەروەردگارم پارێزەرو چاودێری هەموو شتێكە، كارو كردەوەكانتان دەپارێزێ و چی لێ شاراوە نیە ﴿[٥٨] ولما جاء امرنا﴾ وە كاتێ فەرمانمان بۆ لەناوبردنی هۆزەكەی عاد دەرچوو ﴿نجینا هودا والذین آمنوا معه رحمة منا﴾ بەمیهرەبانیی و بەزەیی خۆمان (هوود)و ئەوانەی لەگەڵیا باوەڕیان هێنابوو، ڕزگاركرد ﴿ونجیناهم من عذاب غلیظ﴾ و لەوسزا هەرە سەخت و توندەش لاماندان، ئەوەبوو (با) یەكی زۆر قورس و نەزۆكمان ناردە سەریان و لەبنی هێنان. ﴿[٥٩] وتلك عاد جحدوا بآیات ربهم﴾ ئەمەش بەسەرهاتی هۆزەكەی عاد بوو باسكرا كە بەڵگەو نیشانەكانی پەروەردگاری خۆیان نكووڵیی كردو باوەڕیان نەهێنا ﴿وعصوا رسله﴾ و سەرپێچی و نافەرمانیان لە پێغەمبەرانی خوا كرد، واتە: سەرپێچیان لە هوود وەك سەرپێچیان لەهەموو پەیامبەران كردبێ وایە ﴿واتبعوا امر كل جبار عنید﴾ وەشوێنی فەرمان و بڕیاری هەموو كەسێكی زۆردارو ستەمكارو یاخیكەوتن ، واتە: لەباتی گوێڕایەڵییان بۆپێغەمبەران، پەیڕەوییان لەسەر كارە تاغووتەكانیان كرد! ﴿[٦٠] واتبعوا فی هذه الدنیا لعنة ویوم القیامة﴾ وهەر لەم دونیایەدا، نەحلەتو نەفرینیان بەدوادا چوو، وەلە ڕۆژی قیامەتیش هەروا، دەسا بنۆڕن و بزانن چیمان بەسەر هێنان؟ ﴿الا إن عادا كفروا بربهم﴾ هۆشیار بن و بزانن ! كە گەلی عاد بەرامبەر

الجزء الثاني عشر — سورة هود

إن نقول إلا اعتراك بعض آلهتنا بسوء قال إني أشهد الله
واشهدوا أني بريء مما تشركون (٥٤) من دونه فكيدوني
جميعا ثم لا تنظرون (٥٥) إني توكلت على الله ربي وربكم ما
من دابة إلا هو آخذ بناصيتها إن ربي على صراط مستقيم
(٥٦) فإن تولوا فقد أبلغتكم ما أرسلت به إليكم ويستخلف
ربي قوما غيركم ولا تضرونه شيئا إن ربي على كل شيء حفيظ
(٥٧) ولما جاء أمرنا نجينا هودا والذين آمنوا معه برحمة
منا ونجيناهم من عذاب غليظ (٥٨) وتلك عاد جحدوا بآيات
ربهم وعصوا رسله واتبعوا أمر كل جبار عنيد (٥٩) وأتبعوا
في هذه الدنيا لعنة ويوم القيامة ألا إن عادا كفروا ربهم ألا
بعدا لعاد قوم هود (٦٠) ۞ وإلى ثمود أخاهم صالحا قال
يا قوم اعبدوا الله ما لكم من إله غيره هو أنشأكم من الأرض
واستعمركم فيها فاستغفروه ثم توبوا إليه إن ربي قريب مجيب
(٦١) قالوا يا صالح قد كنت فينا مرجوا قبل هذا أتنهانا أن
نعبد ما يعبد آباؤنا وإننا لفي شك مما تدعونا إليه مريب (٦٢)

قال يا قوم — ٢٢٨

بەپەروەردگاریان بێ وەفاو بێ باوەڕو کافر بوون، بۆیە وایان بەسەر هێنراو دووچار بوون ﴿الا بعدا لعاد قوم هود﴾ دەسا بێدار بن ! وە باهۆزی عاد لەرەحمەت و بەزەیی خوا هەر دوور بن.

**صالح و سەموودی قەومی:**

﴿[٦١] وإلى ثمود اخاهم صالحا﴾ بۆلای هۆزی (سەموود)یش (صالح)ی برایانمان نارد، کە لەنێوان (مەدینە)و (تەبووك)دا دەژیان ﴿قال يا قوم اعبدوا الله مالكم من إله غيره﴾ ئەویش وتی: ئەی هۆزی من ! دەبێ ئێوە هەر خوای تاكو تەنیا بپەرستن، چونکە جگە لە خۆی هیچ پەرستراوێکی تر بەهەق وشایستەی پەرستن نیە ﴿هو انشأكم من الأرض﴾ چونکە هەر ئەوە لەم زەوییە ئێوەی بەرپاکرد و بەدی هێنان ﴿واستعمركم فيها﴾ و کردنیشی بەئاوەدانکەرەوەی زەویی، واتە: دەبێ زەوی بەدارو درەخت و کشتوکاڵ و.. هتد ئاوەدان بکەنەوە. ﴿فاستغفروه﴾ دەسا داوای لێبوردنی تاوان و گوناحەکانتانی لێ بکەن، بەتایبەتی بۆ سەردەمی بت پەرستیتان ﴿ثم توبوا إليه﴾ و پاشانیش تەوبە بکەن و، بەرەوئەو بێنەوەو، واز لەگشت کارێکی خراپ و، بتپەرستی بێنن ﴿إن ربي قريب مجيب﴾ بێگومان پەروەردگارم لەبەندەکانیەوە زۆر نزیك و بەوەڵامە، کەواتە صاڵحبوون دەبێتە هۆی ئەوە کەخوای دلۆڤان، زوو وەڵامی داخوازییەکانتان بداتەوە، لەجێگایەکی تردا بۆ جەخت لە سەر ئەو راستیە خوا دەفەرموێ : (وإذا سألك عبادى عنى فإنى قريب أجيب دعوة الداع إذا دعان..)٢ /١٨٦).

**وتوو ویژێك لەنێوان صالح و نەتەوەکەیدا:**

﴿[٦٢] قالوا يا صالح قد كنت فينا مرجوا قبل هذا﴾ هۆزەکەی لەوەڵامدا وتیان: ئەی صالح ! بەراستیی تۆ بەرلەوە ئەم قسانە بکەیت جێی هیواو ئومێدی ئیمە بوویت، چاوەڕوانبووین ببیتە سالارو گەورەمان ، کەچی بەو قسانە بێ هیوات کردین !﴿اتنهانا ان نعبد ما يعبد آباؤنا﴾ ئایا لەپەرستنی پەرستراوەکانی باوباپیرانمان ڕێمان لێدەگریت ؟ ﴿وإننا لفي شك مما تدعونا إليه مريب﴾ وە بەراستی ئێمە بەرامبەر ئەوخوایە بانگمان دەکەیت بیپەرستین بەگومان و دوو دڵێن ﴿[٦٣] قال يا قوم ارايتم إن كنت على بينة من ربي﴾ صالح پەیامبەر وتی: ئەی گەلی من ! ئەربینیتان بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرام هێناو لەلای پەروەردگارمەوە ﴿وآتاني منه رحمة﴾ رەحمەت وپێغەمبەرێتی پێبەخشیم، ئایا پاش ئەوە دەتوانم سەرپێچی لەفەرمانی بکەم ؟﴿فمن ينصرني من الله إن عصيته﴾ ئەگەر نافەرمانیم کرد، کێ هەیە - بتوانێ لە بەرامبەر سزای خواوە- هاوکاریی و کۆمەکیم بکاو لەسزای لام بدات ؟ ﴿فما تزيدونني غير تخسير﴾ دڵنیابن (بەم هەڵوێستەتانەوە) جگە لەزیان ، هیچ شتێ بۆمن زیاد ناکەن ﴿[٦٤] وياقوم﴾ ئەی خزم و هۆزی من ! ﴿هذه ناقة الله لكم آية﴾ ئەمە ئەو وشترەیە خۆتان داواتانکرد، خوای گەورە بەفەرمانی خۆی

الجزء الثاني عشر — سورة هود

قَالَ يَٰقَوۡمِ أَرَءَيۡتُمۡ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّي وَءَاتَىٰنِي
مِنۡهُ رَحۡمَةٗ فَمَن يَنصُرُنِي مِنَ ٱللَّهِ إِنۡ عَصَيۡتُهُۥۖ فَمَا تَزِيدُونَنِي
غَيۡرَ تَخۡسِيرٖ ٦٣ وَيَٰقَوۡمِ هَٰذِهِۦ نَاقَةُ ٱللَّهِ لَكُمۡ ءَايَةٗ
فَذَرُوهَا تَأۡكُلۡ فِيٓ أَرۡضِ ٱللَّهِۖ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٖ فَيَأۡخُذَكُمۡ
عَذَابٞ قَرِيبٞ ٦٤ فَعَقَرُوهَا فَقَالَ تَمَتَّعُواْ فِي دَارِكُمۡ
ثَلَٰثَةَ أَيَّامٖۖ ذَٰلِكَ وَعۡدٌ غَيۡرُ مَكۡذُوبٖ ٦٥ فَلَمَّا جَآءَ
أَمۡرُنَا نَجَّيۡنَا صَٰلِحٗا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ بِرَحۡمَةٖ مِّنَّا
وَمِنۡ خِزۡيِ يَوۡمِئِذٍۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡعَزِيزُ ٦٦ وَأَخَذَ
ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلصَّيۡحَةُ فَأَصۡبَحُواْ فِي دِيَٰرِهِمۡ جَٰثِمِينَ
٦٧ كَأَن لَّمۡ يَغۡنَوۡاْ فِيهَآۗ أَلَآ إِنَّ ثَمُودَاْ كَفَرُواْ رَبَّهُمۡۗ أَلَا بُعۡدٗا
لِّثَمُودَ ٦٨ وَلَقَدۡ جَآءَتۡ رُسُلُنَآ إِبۡرَٰهِيمَ بِٱلۡبُشۡرَىٰ قَالُواْ
سَلَٰمٗاۖ قَالَ سَلَٰمٞۖ فَمَا لَبِثَ أَن جَآءَ بِعِجۡلٍ حَنِيذٖ ٦٩ فَلَمَّا
رَءَآ أَيۡدِيَهُمۡ لَا تَصِلُ إِلَيۡهِ نَكِرَهُمۡ وَأَوۡجَسَ مِنۡهُمۡ خِيفَةٗۚ
قَالُواْ لَا تَخَفۡ إِنَّآ أُرۡسِلۡنَآ إِلَىٰ قَوۡمِ لُوطٖ ٧٠ وَٱمۡرَأَتُهُۥ قَآئِمَةٞ
فَضَحِكَتۡ فَبَشَّرۡنَٰهَا بِإِسۡحَٰقَ وَمِن وَرَآءِ إِسۡحَٰقَ يَعۡقُوبَ ٧١

٢٢٩

لەبەردە ڕەق و تەقەکە بەدییهێناو کردییە بەڵگەیەکی گەورەو مەزن بۆتان ، لەسەر ڕاستی پێغەمبەرێتی من ﴿فذروها تأكل في أرض الله﴾ دەسا لێیگەڕێن با لەو ئەرزەی خوا بۆ خۆی بخواو بلەوەڕێ ﴿ولا تمسوها بسوء﴾ و بەنیازی خراپەوە دەستی بۆمەبەن و ئازاری مەدەن ﴿فيأخذكم عذاب قريب﴾ ئەگینا سزایەکی نزیك ئەتانگرێ و دووچاردەبن ﴿٦٥ فعقروها﴾ کەچی- صاڵحیان بە درۆزن زانیی و، هەر چوار پەلی وشترەکەیان شکاندو لەت و پەتیان کرد و گۆشتەکەیان دابەشکرد ! ﴿فقال تمتعوا في داركم ثلاثة أيام﴾ ئینجا صالح پێیگوتن: تەمەنی درێژتان تەنها سێ ڕۆژێکە, جالەو خانووبەرەی خۆتانەدا ئەوماوەیە بۆخۆتان بژین و ڕابوێرن، تازەنگی خەتەری سزاکەتان بۆدێ ﴿ذلك وعد غير مكذوب﴾ ئەوهەڕەشەو بەڵێنی خوایە ، ڕاستەو درۆ نییە، واتە: کەسێك نییە بتوانێ بەدرۆی بخاتەوە ﴿٦٦ فلما جاء أمرنا﴾ ئینجا کە لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا فەرمانەکەمان بۆ سزایان هات ﴿نجينا صالحا والذين آمنوا معه برحمة منا﴾ صالح و ئەوانەی باوەڕیان هێنابوو پێی, بەمیهرەبانی و بەزەییەکی تایبەتی خۆمان ڕزگارمانکردن لە تیاچوون ﴿ومن خزي يومئذ﴾ وە لەپەستیی ئەو ڕۆژە پەنامانـدان ﴿إن ربك هو القوي العزيز﴾ بەڕاستیی پەروەردگارت تەنها بۆخۆی زۆر بەهێزو زاڵ و بە توانایە ﴿٦٧ واخذ الذين ظلموا الصيحة﴾ وە بۆ ڕۆژی چوارەم- ئەوانەیان ستەمیانکردبوو- نەعرەتەو دەنگێکی بەهەیبەت (بومەلەرزە، شریخەو بروسکە) گرتنی, لەئەنجامی ئەوەدا شارەکەیان ژێرەو ژوور بوو ﴿فأصبحوا في ديارهم جاثمين﴾ ئیتر هەموو لەخانوو و شوێنەکانی خۆیاندا دەمەو ڕوو کەوتن و مردن ﴿٦٨ كأن لم يغنوا فيها﴾ دەتگوت لەو وڵاتەدا ڕۆژێ نەژیاون و نەبوون ﴿الا إن ثمود كفروا ربهم﴾ بزانن کە بێگومان هۆزەکەی (سەموود) بێ باوەڕو بێ وەفاو سپڵە بوون بەپەروەردگاریان، بۆیە ئەویش وای بەسەرهێنان ﴿الا بعدا لثمود﴾ بێداربن ! بڕیاری دووریی بۆگەلی سەموود لە بەزەیی خوا درا.

**فریشتە مژدەی ئیسحاق و یاقووب دەدەنە ئیبراهیم:**

﴿٦٩ ولقد جاءت رسلنا إبراهيم بالبشرى﴾ بێ سۆ فریشتە ڕاسپاردەو ڕەوانەکراوەکانمان بەمژدەوە هاتنە لای ئیبراهیم و، مزگێنیان بە (ئیسحاق) ی کوڕی دایەو ﴿قالوا سلاما﴾ وتیان سڵاوێ بۆ ئیبراهیم ﴿قال سلام﴾ ئەویش وتی: ئێوەیش بەهەمیشە سڵاوتان لێبێ ﴿فما لبث أن جاء بعجل حنيذ﴾ جادوای بەخێرهاتنیان زوو چوو گۆشتی گوێلکێکی برژاوی بۆ هێنان" و لەبەردەمیان دایناو فەرمووی لێکردن" ﴿٧٠ فلما رأى أيديهم لا تصل إليه﴾ ئینجا کەدیتی دەستی بۆ نابەن و لێیناخۆن ﴿نكرهم﴾ پێیناخۆشبوو و بە نادۆس و ناحەز کەوتنە بەرچاوی ﴿واوجس منهم خيفة﴾ و لێیان ترساو گومانی خراپی لێکردن ﴿قالوا لا تخف﴾ فریشتەکانیش هەستیان پێکردو پێیان وت: مەترسە ﴿إنا أرسلنا إلى قوم لوط﴾ بێگومان ئێمە فریشتەین ونێردراوین بۆلای هۆزی (لووط) لەناویان بەرین ﴿٧١ وامراته قائمة فضحكت﴾ و ژنەکەی (ئیبراهیم) - کە لەپشتی پەردەوە وەستابوو و گوێی لەمزگێنییەکەوە بوو - لەخۆشییا پێکەنی، وەکو دەفەرموێ: ﴿فبشرناها بإسحاق﴾ ئینجا ئێمەش لەسەر زمانی فریشتەکان مژدەمان پێدا بەکوڕێك بەناوی ئیسحاق, شیاوی باسیشە زۆر پیرو بەتەمەن بوو، منداڵیشی نەدەبوو ﴿ومن وراء إسحاق يعقوب﴾ و لەپاش (ئیسحاق)یش، مزگێنیمان بە (یەعقووب)ی کوڕەزای دایە ، واتە: ئیسحاقیش کوڕێکی ئەبێ و ناوی یەعقوب دەبێ ﴿٧٢ قالت يا ويلتى الد وانا عجوز﴾ خێزانی ئیبراهیم بەسەر سورمانێکەوە وتی: ئەی ڕۆ! من منداڵم ئەبێت وەمن پیرەژنێکم؟ ﴿وهذا بعلي شيخا﴾ و ئەمەیش مێردەکەمە، پیرەمێردێکەو، زۆریش بەساڵاچووە ﴿إن هذا لشئ عجيب﴾ بەڕاستیی ئەمە بۆ من ڕووداوێکی سەیروو سەمەرەیە ! ﴿٧٣ قالوا أتعجبين من أمر الله﴾ فریشتەکان وتیان: ئەوە لەکاری خوا سەرسام دەبێت؟ ﴿رحمة الله و بركاته عليكم أهل البيت﴾ ڕەحمەت و بەرەکەتی خواتان

لەسەر بێت ئەی خانەوادەی ماڵی ئیبراهیم! ﴿إنه حميد مجيد﴾ بەراستیی ئەوخوایە هەمیشە سوپاسگوزاری شکۆدارە ، چونکە نازو نیعمەتەکانی ئەوەندە زۆرن لە ئەژمارنایەن. لە(بوخاریی) و (موسلیم)دا هاتووە کە: باوەڕدارەکان بە پێغەمبەریان ﷺ گوت: (وقد علمنا السلام عليك، فكيف الصلاة عليك يارسول الله ؟ قال: ((قولوا: اللهم صل على محمد، وعلى آل محمد، كما صليت على إبراهيم و آل إبراهيم، وبارك على محمد وعلى آل محمد، كما باركت على إبراهيم ، إنك حميد مجيد)) واتە: دەزانین چۆن دروودو سڵاوت بۆ بنێرین، بەڵام نازانین چۆن سەڵەواتت لێبدەین ؟ ئەویش فەرمووی: بڵێن: (اللهم صل...) تاد../ فتح الباری: ٤٦٩/٦ و مسلم:٣٠٥/١.

**ئیبراهیم سکاڵا بۆ هۆزەکەی لووت دەکا:**

الجزء الثاني عشر — سورة هود

قَالَتْ يَٰوَيْلَتَىٰٓ ءَأَلِدُ وَأَنَا۠ عَجُوزٌ وَهَٰذَا بَعْلِى شَيْخًا ۖ إِنَّ هَٰذَا
لَشَىْءٌ عَجِيبٌ ﴿٧٢﴾ قَالُوٓا۟ أَتَعْجَبِينَ مِنْ أَمْرِ ٱللَّهِ ۖ رَحْمَتُ ٱللَّهِ
وَبَرَكَٰتُهُۥ عَلَيْكُمْ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ ۚ إِنَّهُۥ حَمِيدٌ مَّجِيدٌ ﴿٧٣﴾ فَلَمَّا ذَهَبَ
عَنْ إِبْرَٰهِيمَ ٱلرَّوْعُ وَجَآءَتْهُ ٱلْبُشْرَىٰ يُجَٰدِلُنَا فِى قَوْمِ لُوطٍ ﴿٧٤﴾
إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ لَحَلِيمٌ أَوَّٰهٌ مُّنِيبٌ ﴿٧٥﴾ يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ أَعْرِضْ عَنْ هَٰذَآ ۖ إِنَّهُۥ
قَدْ جَآءَ أَمْرُ رَبِّكَ ۖ وَإِنَّهُمْ ءَاتِيهِمْ عَذَابٌ غَيْرُ مَرْدُودٍ ﴿٧٦﴾ وَلَمَّا
جَآءَتْ رُسُلُنَا لُوطًا سِىٓءَ بِهِمْ وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعًا وَقَالَ هَٰذَا
يَوْمٌ عَصِيبٌ ﴿٧٧﴾ وَجَآءَهُۥ قَوْمُهُۥ يُهْرَعُونَ إِلَيْهِ وَمِن قَبْلُ كَانُوا۟
يَعْمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ۚ قَالَ يَٰقَوْمِ هَٰٓؤُلَآءِ بَنَاتِى هُنَّ أَطْهَرُ لَكُمْ ۖ
فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَلَا تُخْزُونِ فِى ضَيْفِىٓ ۖ أَلَيْسَ مِنكُمْ رَجُلٌ رَّشِيدٌ
﴿٧٨﴾ قَالُوا۟ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا لَنَا فِى بَنَاتِكَ مِنْ حَقٍّ وَإِنَّكَ لَتَعْلَمُ مَا نُرِيدُ
﴿٧٩﴾ قَالَ لَوْ أَنَّ لِى بِكُمْ قُوَّةً أَوْ ءَاوِىٓ إِلَىٰ رُكْنٍ شَدِيدٍ ﴿٨٠﴾ قَالُوا۟
يَٰلُوطُ إِنَّا رُسُلُ رَبِّكَ لَن يَصِلُوٓا۟ إِلَيْكَ ۖ فَأَسْرِ بِأَهْلِكَ بِقِطْعٍ
مِّنَ ٱلَّيْلِ وَلَا يَلْتَفِتْ مِنكُمْ أَحَدٌ إِلَّا ٱمْرَأَتَكَ ۖ إِنَّهُۥ مُصِيبُهَا
مَآ أَصَابَهُمْ ۚ إِنَّ مَوْعِدَهُمُ ٱلصُّبْحُ ۚ أَلَيْسَ ٱلصُّبْحُ بِقَرِيبٍ ﴿٨١﴾

٢٣٠ — فلما جاء

﴿[٧٤] فلما ذهب عن إبراهيم الروع﴾ جاکە ئەو ترس و بیمە لەدڵی (ئیبراهیم) دەرچوو و هێور بوویەوە ﴿وجاءته البشرى﴾ و مزگێنیەکەی بۆهات، واتە: مزگێنی بەئیسحاق و یاقووب ﴿يجادلنا في قوم لوط﴾ کەوتە موجادەلەو سکاڵا سەبارەت بە لەناوبردنی هۆزی (لووط) بە مەبەستی دواخستنی سزاکەیان، تا بەشکو بۆ دوایی بڕوا بێنن. **ڕاڤەکەرانی قورئان دەڵێن:** ئەوکاتە کە فریشتەکان هاتن و گوتیان: (إنا مهلكوا أهل هذه القرية) واتە: ئێمە دەمانەوێ خەڵکی ئەم گوندەیە قڕبکەین، ئیبراهیم پێیگوتن: ئەی ئەگەر پەنجا موسڵمانیشی تێدابێت؟ ئێوە هەر لەناویان دەبەن؟ وتیان: نەخێر، وتی: ئەی چل؟ گوتیان: نەخێر. هەر بەو پێیە لەگەڵیان چوو هەتا وتی: باشە! ئەی ئەگەر یەک موسڵمان هەبێت؟ وتیان: نەخێر، ئیبراهیم وتی: (إن فيها لوطا) واتە: دەخۆ (لووط) ی تێدایە ! ﴿[٧٥] إن إبراهيم لحليم أواه منيب﴾ بەراستیی ئیبراهیم پیاوێکی بەحەوسەڵەو لەسەرخۆو غەمخوارو، زۆر تەوبەکارو گەڕاوەیە بۆلای خوا ﴿[٧٦] يا إبراهيم أعرض عن هذا﴾ فریشتەکان وتیان: ئیبراهیم! تۆ لەمە وازبێنەو، لە بارەی قەومەکەی (لووط)ـەوە هیچ مەڵێ ﴿إنه قد جاء أمر ربك﴾ بێگومان بڕیارو فەرمانی پەروەردگارت بڕاوەتەوەو هاتووە بۆ لەناوبردنیان ﴿وإنهم آتيهم عذاب غير مردود﴾ وبە تەئکید سزایەکی نەگێڕدراوەیان بۆ هەیە.

**فریشتە دێنە لای لووت:**

جا لێرەدا پەردە بەسەر دیمەنەکەی ئیبراهیم و خێزانەکەی دادەداتەوەو دەگەڕێتەوە سەرباسەکەی لووط و دەفەرموێ: ﴿[٧٧] ولما جاءت رسلنا لوطا﴾ هەرکە شاندە (فریشتە)کەمان لای (ئیبراهیم) هەڵسان و، هاتنە لای لووط ﴿سئ بهم وضاق بهم ذرعا﴾ پێیان زۆر نارەحەت و دڵتەنگ و پەرێشان بوو، چونکە لەسیمای چەند لاوێکی جوان چاك و جەهێڵدا هاتبوون، ئەمیش ترسا لەهۆزەکەی خۆی بن وبۆ ئەوکارە دزێوو قێزەونە هاتبن و، میوانەکانی بێ

ڕێزو بێ حورمەت بکەن!! ﴿وقال هذا يوم عصيب﴾ بۆیە لەدڵی خۆیدا گوتی: ئای! چ ڕۆژێکی زۆر نارەحەت و سەختە ئەمڕۆ ، ئەمە هەر ئەوڕۆژەیە من لێیدەترسام ﴿[٧٨] وجاء قومه يهرعون إليه﴾ وە قەومەکەی هەر بەبیستنی هاتنی میوانەکان زۆر بەپەلەو بێشەرمانە خۆیان کوتا بۆماڵی لووط و زانییان میوانی هەیە !! ﴿ومن قبل كانوا يعملون السيئات﴾ خۆ پێشتریش هەر خەریکی کاری دزێوی خراپ و بەدفەڕ بوون, سروشتی ڕاستەقینەی مرۆڤییان هەڵوەشابوو، بۆیە لەباتی چوونە لای ژنان دەچوونە لای نێرینە !! جابۆ ئەوە بیان هێنێتەوە سەرباری ڕاستی ژیان دەفەرموێ: ﴿قال يا قوم هؤلاء بناتي هن أطهر لكم﴾ جا کە ئەودیمەنە ئابڕوو بەرەیەی دیت و، بۆ ئەوەیش دەست درێژیی نەکرێتە سەر میوانەکانی، وتی: ئەی قەوم و گەلی من ! ئەمە کیژەکانمن – لەرووی شەرعەوە- پاکترو چاکترن ، مارەیان دەکەم بۆتان ئەگەر واز لەمیوانەکانم بێنن ﴿فاتقوا الله﴾ جا لەخوا بترسن و دەس لەوکارە نابەجێیە بکێشنەوە ﴿ولا تخزون في ضيفي﴾ و لای میوانەکانم شەرمەزارو ڕوو زەردم مەکەن و ئابڕووم مەبەن ﴿أليس منكم رجل رشيد﴾ ئاخۆ پیاوێکی سەلاریان تێدا نەبێت ، فەرمان بەچاکە بداو، ڕێ لەخراپە بگرێت ؟! ﴿[٧٩] قالوا لقد علمت ما لنا في بناتك من حق﴾ ئەوانیش وتیان: بەراستیی خۆت دەزانی کە: ئێمە هیچ مەیل و ئارەزوویەکی کچانی تۆمان نییە ﴿وإنك لتعلم ما نريد﴾ و بۆ خۆشت دەزانی چیمان دەوێت.

**لووط ئاوات بۆ هێز دەخوازێ:**

﴿[٨٠] قال لو أن لي بكم قوة﴾ لووط وتی: ئەگەر لەبەرامبەر ئێوەوە هێزێکم دەبوو، دەمزانی چیمدەکرد (ئیبن عەباس) ئەڵی: واتە:خۆزگە چەند کوڕێکی زیرەك و زرنگم دەبوون ﴿أو آوي إلى ركن شديد﴾ وە یان پەنایەکی خاوەن دەسەڵاتی بە نامووس و لێهاتووم دستدەکەوت و بەرگری لێدەکردم" ئەوسا ئەوکاتە، ئێوە نەتان دەتوانی ئابەو شێوەیە بێنە سەرمیوانم، واتە: ئەی کاش! عەشرەت و هۆزو خێڵێکی بەهێزی وام دەبوو ﴿قالوا يالوط انا رسل ربك﴾ فریشتەکانیش کەدیتیان بەوجۆرە بەرەوانی لەمیوانەکانی دەکاو، خەفەتبارە بۆیان، وتیان: ئەی لووت! بەڕاستی ئێمە فریشتەی خواوەندی تۆین و نێردراوینە لای تۆ ﴿لن يصلوا إليك﴾ دڵنیابە هەرگیز ئەو بەدکارانە ناتوانن دەستی ناپاکیان بگەیەننە تۆ بەدەستدرێژی بۆ میوانەکانت ﴿فأسر بأهلك بقطع من الليل﴾ جا تۆ لەگەڵ خانەوادەکەت بەشێکی زۆری شەو بمێنێ دەرچن ﴿ولا يلتفت منكم أحد إلا امرأتك﴾ و ژنەکەت نەبێ هیچ کەستان بەرەو دوا لانەکاتەوە ﴿إنه مصيبها ما أصابهم﴾ چونکە هەرچی تووشی ئەوخەڵکە لاسارە دەبێ، دڵنیابە تووشی ئەویش دەبێ، لەوە دەچێت لووط کەمێ پەلەی بووبێت، بۆیەخوای گەورە فەرمووی: ﴿إن موعدهم الصبح﴾ بێگومان کاتی سزاکەیان دەمی بەیانە ﴿أليس الصبح بقريب﴾ مەگەر دەمی بەیان نزیك نییە ؟

**گوندەکانی قەومی لووط سەرەو نخوون بوون:**

﴿[٨٢] فلما جاء أمرنا جعلنا عليها سافلها﴾ جاکە لەکاتی خۆیدا فەرمانەکەمان گەیشت بۆ تیاچوونیان، شارو گوندە کانیانمان ژێرو ژوورکرد، واتە: لەبنمان هێنان و، سەرو خواربوون ﴿وأمطرنا عليهم حجارة من سجيل منضود﴾ و بەقوڕی سوورەوە کراوی ڕەقی - چین لەسەر چین - وەك بەردە گڵ بەردە بارانمان کردن و دەرئەنجام خانوو و بەرەکەیان بوویە دەریایەکی تاڵ و تفت و، ئاوەکەشی کەڵکی هیچ شتێکی نەما، پاشان بەدەریای مردوو (البحر الميت) و بەدەریاچەی لووت (بحيرة لوط) ناو بانگی دەرکرد ﴿[٨٣] مسومة عند ربك﴾ بەردەکانیش هەریەکە لای پەروەردگارت ناوونیشانی ئەوکەسەی بۆ دیاری کراو بوو، لێی بدات ﴿وماهي من الظالمين ببعيد﴾ خۆ ئەو ناوچەو وڵاتە وێرانکراوە لەستەمکارانی قورەیشەوە دوور نییە ، بۆعیبرەت وەرگرتن، بەڵکو زۆر جارانیش بەلایا

تێدەپەڕن، واچاکە بۆیان عیبرەتی لیٚ وەرگرن. یان دەڵێین: بەڵاو بەسەرهاتی ئاوا سەبارەت بەستەمکاران هیچ دوور نییە، واتە: گشت ستەمکارێکی لەوچەشنە بەڵای ئاوای پڕ بە باڵایە. (ئەبو داود وتیرمزیی و ئیبن ماجە) لە (ئیبن عەبباس) ئەم فەرمودیە دەهینن: ((من وجدتموه يعمل عمل قوم لوط فاقتلوا الفاعل والمفعول به)). واتە: هەر کەسێکتان دیت کاری گەلی لووطی دەکرد، هەردووکیان - بکەرو کار لەگەڵ کراو- بکوژن. بۆیە پیشەوا شافیعیی لە فەرموودەیەکیاو دەستەیەك لە زانایانیش ئەڵێن: بکەرەکە (هەر کەسیٚ ببیٚ دەکوژریٚ)، واتە: ژندار بێت، یان نا.(ئەبو حەنیفە)یش دەڵیٚ: دەبیٚ (فاعل)ە کە لە شاخێکی بەرزەوە بخرێتە خوارەوەو پاشانیش بەردە باران بکریٚ، وەکو گەلەکەی لووط بەردە باران کرا.

**شوعەیب نێردرا بۆ مەدیەن:**

﴿[٨٤] والى مدين اخاهم شعيبا﴾ بۆلای خەڵکی (مەدیەن)یش براو کەسی خۆیان، (شوعەیب)مان بەپێغەمبەرێتی نارد. (مەدیەن) دەکەوێتە سنووری حیجاز، لەولایشەوە هاوسنووری شامە ﴿قال يا قوم اعبدوا الله ما لكم من إله غيره﴾ وتی: ئەی گەلی من ! هەر بە گوێی خوا بکەن و، بەتەنیا هەرئەویش بپەرستن، غەیری ئەو خوایەکی تر شیاوی پەرستن بێت نییە، جا لەگەڵ ئەوەشدا ئەو قەومە کافرو خوا نەناسبوون ، بۆیە فەرمووی: ﴿ولا تنقصوا المكيال والميزان﴾ وریابن! لەکێشانەو پێوانەدا کەم و کورتیی مەکەن ، واتە: لەمامەڵەدا خەڵکی مەخەڵەتێنن ﴿إني أراكم بخير﴾ چونکە دەتانبینم لە خۆشگوزەرانیی و، دەسەڵات ومالٚ و سامانێکی زۆردان ، چ پێویستتان بەخەڵەتاندنی مەردم نیە؟ ﴿وإني أخاف عليكم عذاب يوم محيط﴾ وە بەڕاستیی من لەسەرتان دەترسم سزای ڕۆژێکی گشتگیرتان ئەوقە ببێت" ئەر لەفەرمانم دەرچن ﴿[٨٥] ويا قوم أوفوا المكيال والميزان بالقسط﴾ ئەی هۆزو نەتەوەی من! باپێوانەو کێشانەتان تێرو تەواو و دادگەرانە بیٚ ﴿ولا تبخسوا الناس أشياءهم﴾ شتوومەکی خەڵکی کەم نرخ دامەنێن و مەیان خەڵەتێنن ﴿ولا تعثوا في الأرض مفسدين﴾ لەوڵاتیشدا فەسادو خراپەکاریی بڵاومەکەنەوە, واتە: تەرازوو بازوویش بەشێکە لە فەسادو کاری گەندەڵیی لەوڵاتدا ﴿[٨٦] بقية الله خير لكم إن كنتم مؤمنين﴾ ڕسق و ڕۆزیی و قازانجێك کەخوا بیٚ تەرازوو بازوو بۆتان دیٚڵێتەوە چاکترە، لەو سامانەی کە بەخیانەت و تەرازوو بازوو وەری دەگرن، ئەر بڕواتان هەبیٚ ﴿وما انا عليكم بحفيظ﴾ و خۆ منیش بەرامبەر بەو کێشانەو پێوانە ئێوە دەیکەن, پارێزەرو بەرپرسنیم، چونکە من تەنها ئامۆژگارم و حەق و ڕاستیی ڕادەگەیەنم ، ئیتر تاوان و گوناحەکەی بۆ خۆتانە.



فَلَمَّا جَآءَ أَمۡرُنَا جَعَلۡنَا عَٰلِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمۡطَرۡنَا عَلَيۡهَا حِجَارَةٗ مِّن سِجِّيلٖ مَّنضُودٖ ﴿٨٢﴾ مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَۖ وَمَا هِيَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ بِبَعِيدٖ ﴿٨٣﴾ ۞ وَإِلَىٰ مَدۡيَنَ أَخَاهُمۡ شُعَيۡبٗاۚ قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥۖ وَلَا تَنقُصُواْ ٱلۡمِكۡيَالَ وَٱلۡمِيزَانَۖ إِنِّيٓ أَرَىٰكُم بِخَيۡرٖ وَإِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٖ مُّحِيطٖ ﴿٨٤﴾ وَيَٰقَوۡمِ أَوۡفُواْ ٱلۡمِكۡيَالَ وَٱلۡمِيزَانَ بِٱلۡقِسۡطِۖ وَلَا تَبۡخَسُواْ ٱلنَّاسَ أَشۡيَآءَهُمۡ وَلَا تَعۡثَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُفۡسِدِينَ ﴿٨٥﴾ بَقِيَّتُ ٱللَّهِ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَۚ وَمَآ أَنَا۠ عَلَيۡكُم بِحَفِيظٖ ﴿٨٦﴾ قَالُواْ يَٰشُعَيۡبُ أَصَلَوٰتُكَ تَأۡمُرُكَ أَن نَّتۡرُكَ مَا يَعۡبُدُ ءَابَآؤُنَآ أَوۡ أَن نَّفۡعَلَ فِيٓ أَمۡوَٰلِنَا مَا نَشَٰٓؤُاْۖ إِنَّكَ لَأَنتَ ٱلۡحَلِيمُ ٱلرَّشِيدُ ﴿٨٧﴾ قَالَ يَٰقَوۡمِ أَرَءَيۡتُمۡ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّي وَرَزَقَنِي مِنۡهُ رِزۡقًا حَسَنٗاۚ وَمَآ أُرِيدُ أَنۡ أُخَالِفَكُمۡ إِلَىٰ مَآ أَنۡهَىٰكُمۡ عَنۡهُۚ إِنۡ أُرِيدُ إِلَّا ٱلۡإِصۡلَٰحَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُۚ وَمَا تَوۡفِيقِيٓ إِلَّا بِٱللَّهِۚ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ وَإِلَيۡهِ أُنِيبُ ﴿٨٨﴾

**وەڵامی مەدیەن بۆ شوعەیب ناشایستەبوو:**

﴿[٨٧] قالوا یا شعیب﴾ خەڵکەکە وتیان: ئەرێ شوعەیب ! ﴿اصلاتك تأمرك ان نترك ما یعبد آباؤنا﴾ ئایا نوێژەکەت فەرمانت پێ دەکا کە: ئێمە لەپەرستنی ئەو پەرستراوانە باوو باپیرانمان ئەیانپەرستن دەست هەڵگرین ؟!.(شوعەیب) ﷺ پیاوێکی زۆر نوێژ خوێن و عابید بوو، بۆیە ئەوانیش گوتیان: مەر نوێژەکەت هانی ئەوکارەت دەدا ؟. ﴿او ان نفعل فی اموالنا مانشاء﴾ یان ڕێمان لێگریت کە بەئارەزووی خۆمان چیمان بوێت لەماڵو سامانەکەماندا ئەنجامی بدەین ؟ واتە: ئەتەوێ لەتەرازوو بازیی ڕێمان لێبگرێت؟ ﴿إنك لأنت الحلیم الرشید﴾ ئەوجا بەگاڵتەوە پێیان وت: خۆتۆ-بەلای خۆتەوە-پیاوێکی هێمن و لەسەر خۆو فامیدەو سەلاریت !! چۆن فەرمانمانی پێ دەکەیت ؟! ﴿[٨٨] قال یا قوم ارایتم إن کنت علی بینة من ربی﴾ شوعەیب وتی: ئەی قەوم و گەلەکەم ! باشە ئەگەر من بەڵگەیەکی ئاشکراو روونم لەلای پەروەردگارمەوە بۆهێنابن ﴿ورزقنی منه رزقا حسنا﴾ و رزق و ڕۆزییەکی چاك و حەلاڵی پێدابم ، یان پەیامبەرێتی پێ بەخشیبم، چ عەیبەیەکی تێدایە، کەمن داوای ئیسلاح و چاکسازیی لەناو ئێوەدا بکەم و، نەهێڵم یەکتری بخەڵەتێنن ؟ ﴿وما ارید ان اخالفکم إلی ما انهاکم عنه﴾ ناشمەوێ شتێ لە ئێوە قەدەغە بکەم و، بۆخۆم بیکەم. ﴿إن ارید إلا الإصلاح ما استطعت﴾ هەتا بشتوانم هەر چاکسازیی و، ڕێك و پێك کرنی حاڵی ئێوەم دەوێت ، ئەمەوێ ئێوە دەسپاك و دادگەربن. ﴿وما توفیقی إلا بالله﴾ خۆ تەوفیق و دۆزینەوەی ڕێی راست و هیدایەتیشم تەنها بەخوایە ﴿علیه توکلت وإلیه انیب﴾ پشتم بەو بەستووەو هەر بۆلای ئەویش دەگەڕێمەوە ﴿[٨٩] ویاقوم لا یجرمنکم شقاقی﴾ ئەی خزم و گەلی من! دەخیلتانم ناکۆکیی و دژایەتیتان بەرامبەر بەمن هەڵتان نەنێت بۆ سوور بوونتان لەسەر بێ بڕوایی ﴿ان یصیبکم مثل ما اصاب قوم نوح او قوم هود او قوم صالح﴾ کە بەو هۆیەوە دوچاری ئەو بەڵایە بن کە: دووچاری گەلی نوح و گەلی هودو گەلی صالح بوو ﴿وما قوم لوط منکم ببعید﴾ خۆ بەسەرهاتی هۆزەکەی (لووط)یش لەئێوەوە دوورێکی وا نییەو، دەشزانن چیمان بەسەر هێنان، دەسا ئیتر هەقە ئامۆژگاری وەرگرن، بۆ ئەوەی دووچاری ئەوبەڵایەی ئەوان نەبن ﴿[٩٠] واستغفروا ربکم ثم توبوا إلیه﴾ وە لەپەروەردگارتان بخوازن لێتان ببوورێت، پاشانیش تەوبەی لابکەن و بچنەوە بۆلای ﴿إن ربی رحیم ودود﴾ بەڕاستیی پەروەردگارم بەرامبەر تەوبەکاران زۆر دڵاوا میهرەبان و بەبەزەیی یە ، زۆریش پێی پێخۆشە.

الجزء الثاني عشر — سورة هود

وَيَٰقَوۡمِ لَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شِقَاقِيٓ أَن يُصِيبَكُم مِّثۡلُ مَآ أَصَابَ
قَوۡمَ نُوحٍ أَوۡ قَوۡمَ هُودٍ أَوۡ قَوۡمَ صَٰلِحٖۚ وَمَا قَوۡمُ لُوطٖ مِّنكُم
بِبَعِيدٖ ﴿٨٩﴾ وَٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِۚ إِنَّ رَبِّي
رَحِيمٞ وَدُودٞ ﴿٩٠﴾ قَالُواْ يَٰشُعَيۡبُ مَا نَفۡقَهُ كَثِيرٗا مِّمَّا تَقُولُ
وَإِنَّا لَنَرَىٰكَ فِينَا ضَعِيفٗاۖ وَلَوۡلَا رَهۡطُكَ لَرَجَمۡنَٰكَۖ وَمَآ أَنتَ
عَلَيۡنَا بِعَزِيزٖ ﴿٩١﴾ قَالَ يَٰقَوۡمِ أَرَهۡطِيٓ أَعَزُّ عَلَيۡكُم مِّنَ
ٱللَّهِ وَٱتَّخَذۡتُمُوهُ وَرَآءَكُمۡ ظِهۡرِيًّاۖ إِنَّ رَبِّي بِمَا تَعۡمَلُونَ
مُحِيطٞ ﴿٩٢﴾ وَيَٰقَوۡمِ ٱعۡمَلُواْ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمۡ إِنِّي عَٰمِلٞۖ
سَوۡفَ تَعۡلَمُونَ مَن يَأۡتِيهِ عَذَابٞ يُخۡزِيهِ وَمَنۡ هُوَ
كَٰذِبٞۖ وَٱرۡتَقِبُوٓاْ إِنِّي مَعَكُمۡ رَقِيبٞ ﴿٩٣﴾ وَلَمَّا جَآءَ
أَمۡرُنَا نَجَّيۡنَا شُعَيۡبٗا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ بِرَحۡمَةٖ مِّنَّا وَأَخَذَتِ
ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلصَّيۡحَةُ فَأَصۡبَحُواْ فِي دِيَٰرِهِمۡ جَٰثِمِينَ ﴿٩٤﴾
كَأَن لَّمۡ يَغۡنَوۡاْ فِيهَآۗ أَلَا بُعۡدٗا لِّمَدۡيَنَ كَمَا بَعِدَتۡ ثَمُودُ ﴿٩٥﴾ وَلَقَدۡ
أَرۡسَلۡنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَا وَسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٍ ﴿٩٦﴾ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ
وَمَلَإِيْهِۦ فَٱتَّبَعُوٓاْ أَمۡرَ فِرۡعَوۡنَۖ وَمَآ أَمۡرُ فِرۡعَوۡنَ بِرَشِيدٖ ﴿٩٧﴾

يَقۡدُمُ قَوۡمَهُۥ — ٢٣٢

**بۆپاراستنی هەق هێزو دەسەلات پێویستە:**

﴿٩١ قالوا يا شعيب ما نفقه كثيرا مما تقول﴾ ئەو نالەبارانە لەوەلامدا وتیان: شوعەیب ! ئێمە لەزۆرێکی قسەکانت تێناگەین ! دیارە بەگاڵتەو بەلاقرتیی ئەوقسە دەکەن , چونکە ناگونجیّ (شوعەیب)ێکی پێغەمبەر نەزانیّ چۆن وتاریان بۆ بداو تێیان بگەیەنیّ، کە لە(ئەسەر)دا هاتووە دەڵێت: (شعيب خطيب الأنبياء) واتە: (شوعەیب) ﷺ دواندەرو خەتیبی پێغەمبەرەکانە، هەروەك ئیمامی (سەوریی)یش هەمان قسە دەکا ﴿و إنا لنراك فينا ضعيفا﴾ وە بێگومان لەناو خۆشماندا بەمرۆڤێکی لاوازو، کەم وزەو کەم سیاسەتت دەزانین ﴿ولولا رهطك لرجمناك﴾ ئەر لەبەر دەستەو بەستەکەشت نەبا، ئێستا بەردە بارانمان دەکردیت و ئەمانکوشتیت ﴿وما انت علينا بعزيز﴾ خۆلای ئێمەیش تۆ خاوەن تواناو بەدەسەلات نیت ﴿٩٢ قال يا قوم أرهطى اعز عليكم من الله﴾ شوعەیب وتی: ئەی هۆزو گەلی من! ئاخۆ دەستەو کۆمەلّ و عەشیرەتەکەمتان لەخوا لا بەتواناو بەدەسەلات ترە ، وا لەخوا شەرم ناکەن و، لەعەشیرەتەکەم شەرم دەکەن و دەترسن ﴿واتخذتموه وراءكم ظهريا﴾ و خواتان پشتگویّ خستووەو بەفەرمانی ئەو کار ناکەن؟! ﴿إن ربى بما تعملون محيط﴾ بەڕاستیی پەروەردگارم بەو کوفرو تاوانە ئێوە دەیکەن بەئاگاو زانایەو،هیچ شتێکی لێگوم نابێت.

**شوعەیب هەڕەشە لە قەومەکەی دەکا:**

﴿٩٣ ويا قوم اعملوا على مكانتكم إنى عامل﴾ ئەی خزم و گەلی من! هەر بەوشێوە کارتان دەکرد، بیکەن و دریغی مەکەن، بەڕاستیی وا منیش سوورم لەسەر ئەنجامدانی کاری خۆم ﴿سوف تعلمون من يأتيه عذاب يخزيه﴾ لەمەولاش ئەزانن کیّ سزایەکی بۆ دێت و ریسوای دەکات ﴿ومن هو كاذب﴾ و کێیش درۆزن دەردەچیّ ئێوە، یان ئێمە؟ ﴿وارتقبوا إنى معكم رقيب﴾ دەئێوە چاوەڕوانی سزاو جەزرەبە بن، بەڕاستیی وامنیش لەگەلّ ئێوە چاوەڕوانی سەرکەوتن دەبم ﴿٩٤ ولما جاء امرنا﴾ و کاتیّ کەفەرمانی ئێمە هات بۆ سزادانیان ﴿نجينا شعيبا والذين آمنوا معه برحمة منا﴾ بەبەزەیی و دلۆڤانی خۆمان ، شوعەیب و ئەوانەی بڕوایان پیّ هێنابوو ڕزگارمان کردن ﴿وأخذت الذين ظلموا الصيحة﴾ و تاوانبارو ستەمکارەکانیشمان بەدەنگ وشریخەیە مەزن گرت ﴿فأصبحوا فى ديارهم جاثمين﴾ و ئینجا لەشوێنەکانی خۆیاندا هەموو دەمەو ڕوو کەوتن و مردن ﴿٩٥ كأن لم يغنوا فيها﴾ بەشێوەیەك، دەتگوت هەرگیز لەویّ نیشتەجیّ نەبوون و نەژیاون ﴿الا بعدا لمدين﴾ بێدار بن! یاخوا خەلّکی (مەدیەن) لەبەزەیی خواوە دووربن ﴿كما بعدت ثمود﴾ هەر وەکو گەلی (سەموود) تیاچوون و دوورکەوتنەوە لەبەزەیی و سۆزی خوا.

**سەرگوزەشتەی مووسا و فیرعەون:**

﴿٩٦ ولقد ارسلنا موسى بآياتنا وسلطان مبين﴾ و بێگومان موسا پێغەمبەریشمان بەچەندین نیشانەی روون و بەلّگەی ئاشکراوە ناردە ﴿٩٧ إلى فرعون وملأئه﴾ لای فیرعەون و پیاوە گەورەکانی ﴿فاتبعوا أمر فرعون﴾ (کبار رجالە) فیرعەون فەرمانی کرد پەیڕەوی بکەن، ئەوانیش لەفەرمان و قسەی فیرعەون پەیڕەوییان کرد ﴿وما أمر فرعون برشيد﴾ خۆ فەرمانی فیرعەونیش راست و دروست و ڕەوا نەبوو، بەلّکو چەواشەگەریی گومڕایی بوو ﴿٩٨ يقدم قومه يوم القيامة﴾ لەڕۆژی قیامەتیشدا فیرعەون لەبەر ئەوە پاشاو گەورەیان بوو پێشیان دەکەویّ بۆ نێو دۆزەخ ﴿فأوردهم النار﴾ جا دەیانباتە ناو ئاگری دۆزەخەوە ﴿وبئس الورد المورود﴾ و چەند خراپ و نالەبارە ئاگر ، جێی ئاوخواردنەوەو، حەوانەوەی گەلێکی تینووی خەستە بیّ ﴿٩٩ واتبعوا فى هذه لعنة و يوم القيامة﴾ لەم دونیایەو،

لەڕۆژی قیامەتیشدا لەرەحمەتی خوا دوورن‌و، نەحلەت‌و نەفرینی ئەویان بەدواوەیە ﴿بئس الرفد المرفود﴾ چەند خراب و نالەبارە، نەفرەت لەدوای نەفرەت!.

**لەگوندە وێرانەکان عیبرەت وەر گرن:**

﴿[١٠٠] ذلك من أنباء القرى نقصه عليك﴾ ئەو چیرۆك و داستانانە بۆت دەگێڕینەوە گشت بەشێکن لەدەنگ و باسی خەڵکی ئەوشارو دێ وێرانکراوانە ﴿منها قائم وحصيد﴾ تەنانەتی ئێستاش هەندێکیان بەپێوەن و شوێنەواریان دیارە ئەگەرچی خەڵکەکەیشی تیاچوو بێ ، هەندێکیشی وەك دانەوێڵە دروێنە کراون و، بەسەریەکا خران‌و لەبەین چوون ﴿[١٠١] وما ظلمناهم﴾ خۆ ستەمیشمان لێنەکردن لەو تیاچوونەدا ﴿ولكن ظلموا أنفسهم﴾ بەڵکو ئەوان خۆیان ستەمیان لەخۆیان کرد، بەکوفرو نافەرمانی کردن ﴿فما اغنت عنهم آلهتهم التى يدعون من دون الله من شئ لما جاء أمر ربك﴾ ئینجا کە بڕیارو فەرمانی پەروەردگارت بۆ تیاچونیان هات، ئیتر ئەوگشت بتانە کە لەجیاتی خوا دەیانپەرستن فریایان نەکەوتن و، نەیانتوانی هیچێك لەسزا بێ نیازیان کەن ﴿وما زادوهم غير تتبيب﴾ و تیاچوون و ماڵ وێرانی نەبێ، شتێکیان بۆ زیاد نەکردن ﴿[١٠٢] وكذلك أخذ ربك﴾ سزاو قاری پەروەردگارت ئاوایە ﴿إذا أخذ القرى وهى ظالمة﴾ کاتێ ویستی خەڵکانی ستەمکاری شارو گوند نشینەکان لەناوبەرێت ﴿إن اخذه اليم شديد﴾ کەبەڕاستیی سزاو قارێکی سەخت و ئێش پێگەیەنەر بوو ﴿[١٠٣] إن فى ذلك لآية لمن خاف عذاب الآخرة﴾ بێگومان لەو بەڵاو سزایەدا نیشانەو بەڵگەیەکی گەورەو مەزن هەیە، بۆ هەرکەسێك لەسزای دوا ڕۆژ بترسێت و، بیەوێ پارێزراو بێت لێی ﴿ذلك يوم مجموع له الناس﴾ ئەوە ڕۆژێکی وایە هەموو خەڵکی بۆ کۆ ئەکرێتەوە ﴿وذلك يوم مشهود﴾ و ئەوە ڕۆژێکە هەموو ئادەمیزاد چاك و خراپ دەیبینن و ئامادەی دەبن ﴿[١٠٤] وما نؤخره إلا لأجل معدود﴾ و هەر بۆکاتێکی کەمی هەڵژمێرراو و دیاریمان دوا خستووەو، لە (ئەزەل)دا بڕاوەتەوە کەی دێت ﴿[١٠٥] يوم يأتى لا تكلم نفس إلا بإذنه﴾ ڕۆژێکیش کەدێت هیچ کەسێك بۆی نییە بەفەرمانی خوا نەبێت قسە بکات ﴿فمنهم شقى وسعيد﴾ ئینجا ئەو خەڵکە دەبنە دوو کۆمەڵ، هەیانە بەهۆی لاساریی و کلابوونیەوە بەدبەختەو چارە ڕەش، هەشیانە بەبۆنەی چاکی و باشی خۆیەوە بەختیارو ڕوو سپی یە.

الجزء الثاني عشر — سورة هود

يَقْدُمُ قَوْمَهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فَأَوْرَدَهُمُ ٱلنَّارَ ۖ وَبِئْسَ ٱلْوِرْدُ
ٱلْمَوْرُودُ (٩٨) وَأُتْبِعُوا۟ فِى هَٰذِهِۦ لَعْنَةً وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ بِئْسَ
ٱلرِّفْدُ ٱلْمَرْفُودُ (٩٩) ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْقُرَىٰ نَقُصُّهُۥ عَلَيْكَ ۖ
مِنْهَا قَآئِمٌ وَحَصِيدٌ (١٠٠) وَمَا ظَلَمْنَٰهُمْ وَلَٰكِن ظَلَمُوٓا۟
أَنفُسَهُمْ ۖ فَمَآ أَغْنَتْ عَنْهُمْ ءَالِهَتُهُمُ ٱلَّتِى يَدْعُونَ مِن دُونِ
ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ لَّمَّا جَآءَ أَمْرُ رَبِّكَ ۖ وَمَا زَادُوهُمْ غَيْرَ تَتْبِيبٍ (١٠١)
وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَآ أَخَذَ ٱلْقُرَىٰ وَهِىَ ظَٰلِمَةٌ ۚ إِنَّ أَخْذَهُۥٓ
أَلِيمٌ شَدِيدٌ (١٠٢) إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّمَنْ خَافَ عَذَابَ ٱلْءَاخِرَةِ ۚ
ذَٰلِكَ يَوْمٌ مَّجْمُوعٌ لَّهُ ٱلنَّاسُ وَذَٰلِكَ يَوْمٌ مَّشْهُودٌ (١٠٣) وَمَا
نُؤَخِّرُهُۥٓ إِلَّا لِأَجَلٍ مَّعْدُودٍ (١٠٤) يَوْمَ يَأْتِ لَا تَكَلَّمُ نَفْسٌ
إِلَّا بِإِذْنِهِۦ ۚ فَمِنْهُمْ شَقِىٌّ وَسَعِيدٌ (١٠٥) فَأَمَّا ٱلَّذِينَ شَقُوا۟ فَفِى
ٱلنَّارِ لَهُمْ فِيهَا زَفِيرٌ وَشَهِيقٌ (١٠٦) خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ
ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَ ۚ إِنَّ رَبَّكَ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ
(١٠٧) ۞ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ سُعِدُوا۟ فَفِى ٱلْجَنَّةِ خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ
ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَ ۖ عَطَآءً غَيْرَ مَجْذُوذٍ (١٠٨)

الحزب ٢٤

٢٣٣

**ئایینده‌و پاشە ڕۆژی خەڵکانی بەدبەخت:**

﴿[١٠٦] فأما الذين شقوا﴾ جا ئەوانەیان بەدبەخت ولارو لاسارن ﴿ففى النار لهم فيها زفير وشهيق﴾ لەئاگردان، هەر لەوێیش تووشی هەناسە کورتی و، تەنگە نەفەسیی دەبن‌و، هەر هاوار هاواریانە. (تەبەریی) ئەڵێت: کاتێ کە گوێدرێژ دەست بەزەڕیین دەکات، پێی دەڵێن: (زفير)، کەدەیشیبڕێتەوە پێیدەڵێن (شهيق). مەبەست ئەوەیە کە لەتاو

سزادا هاوارو زەرە زەرێك دەست پێدەكەن، هەر دەڵێیت سەرەی گوێدرێژە، زۆر بەسەخت هەناسە هەڵدەمژن و، هەناسە دەدەنەوە ﴿١٠٧ خالدين فيها ما دامت السموات والأرض﴾ تا ئاسمانەكان و زەویی هەبن، ئەوانیش تێیدا ئەمێننەوە. عەرەب ئەگەر ویستبای بڵێ ئەو شتە بەردەوام و هەمیشەیە، دەیگوت: (ما دامت السموات والأرض) كەوابوو بەهەتا هەتایی لەدۆزەخدا دەمێننەوەو لێی دەرناچن ﴿إلا ما شاء ربك﴾ مەگەر پەروەردگارت بیەوێ لە وەخت و كاتێكدا دەریان بهێنێ بۆئەوەی بەجۆرێكی تر لەسزا سزایان بدات ﴿إن ربك فعال لما يريد﴾ بەڕاستیی پەروەردگاریشت زۆر بەدەسەڵاتە، بیەوێ هەرشتێ بكات دەیكات و هیچ بەرگرێكی بۆ نابێت ﴿١٠٨ وأما الذين سعدوا﴾ ئەوانەیشیان كامەران و بەختەوەرن ﴿ففی الجنة خالدين فيها﴾ لەئەوەڵ لەحزەوە لە بەهەشتن و، بۆ هەمیشە لەوێ ئەمێننەوە ﴿ما دامت السموات والأرض إلا ماشاء ربك﴾ تا ئاسمانەكان و زەویی ببن، مەگەر ئەوەندە پەروەردگارت مەیلی هەبێ كارێ تر بكات، جا ئەوكاتە لەبەهەشتدا نابن. (ئیبنی كەسیر) ئەڵێت: مانەوەیان لەبەهەشتدا بەهەتا هەتایی واجیب و پێویست نییە لەسەر خوا، بەڵكو خوا بەفەزڵ و منەتیەتی، جا بۆئەوە سوپاس و تەسبیحاتی بكەن زیكری (سبحان الله، الحمدلله)، ئەخرێتە سەر زاریان ﴿عطاء غير مجذوذ﴾ ئەو بەخششە هەتاهەتایی و نەبڕاوەیە.

### شیرك سەرلێشێواوییە شكی تیا نیە :

﴿١٠٩ فلا تك فی مرية مما يعبد هؤلاء﴾ جا تۆ هیچ گومانت نەبێ لەهیچ و پووچی ئەو بتانەی ئەوانە دەیانپەرستن ﴿ما يعبدون إلا كما يعبد آباؤهم من قبل﴾ چونكە ئەمانیش هەر ئەوە دەپەرستن وەك باوو باپیرانیان پێشتر دەیان پەرست، واتە: وەك باب و باپیرانیان لە بتپەرستیدان ﴿وإنا لموفوهم نصيبهم غير منقوص﴾ و بەڕاستیی ئێمە بەتێرو تەسەلیی و بەتەواوی پاداش و تۆڵەیان دەدەین ﴿١١٠ ولقد آتينا موسى الكتاب﴾ ئەمە سوێندی بێت كتێبی (تەورات)مان بە مووسادا ﴿فاختلف فيه﴾ جا بۆدوایی ناكۆكیی و جیاوازیی تیا دروستبوو، هەندێ بڕوایان بەگشت بڕگەو ئایەتەكانی هێنا، هەندێكیش بێ باوەڕبوون، هەر چۆنێ ئەم هۆزو نەتەوەی تۆیە (ئەی موحەممەد!) ناكۆكن و هەرایانە، جا كەوابوو حەوسەڵەو تاقەتت بێت ﴿ولولا كلمة سبقت من ربك﴾ خۆ ئەر لەبەر ئەوبڕیارو فەرمانە نەبووبا كەلە (ئەزەل)دا لەپەروەردگارتەوە دەرچووە بۆ دواخستنی سزاو لەناو بردنیان ﴿لقضی بينهم﴾ داوەریی دەكران و سزا دەدران ﴿وإنهم لفی شك منه مريب﴾ بێگومان جوولەكە سەبارەت بەڕاستی قورئان لەگومانێكدان دوودڵی پەیدا دەكات ﴿١١١ وإن كلا لما ليوفينهم ربك أعمالهم﴾ بێگومانیش پەروەردگارت بەتێرو تەسەلی پاداشی هەموو كردەوەكانیان دەداتەوە لەدواڕۆژدا ﴿إنه بما يعملون خبير﴾ چونكە هەركارێ بكەن بێگومان خوای گەورە بەئاگایە لێی.



فَلَا تَكُ فِي مِرْيَةٍ مِّمَّا يَعْبُدُ هَٰٓؤُلَآءِ مَا يَعْبُدُونَ إِلَّا كَمَا يَعْبُدُ
ءَابَآؤُهُم مِّن قَبْلُ وَإِنَّا لَمُوَفُّوهُمْ نَصِيبَهُمْ غَيْرَ مَنقُوصٍ ﴿١٠٩﴾
وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ فَٱخْتُلِفَ فِيهِ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ
سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَقُضِيَ بَيْنَهُمْ وَإِنَّهُمْ لَفِي شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ
﴿١١٠﴾ وَإِنَّ كُلًّا لَّمَّا لَيُوَفِّيَنَّهُمْ رَبُّكَ أَعْمَٰلَهُمْ إِنَّهُۥ بِمَا يَعْمَلُونَ
خَبِيرٌ ﴿١١١﴾ فَٱسْتَقِمْ كَمَآ أُمِرْتَ وَمَن تَابَ مَعَكَ وَلَا تَطْغَوْا
إِنَّهُۥ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿١١٢﴾ وَلَا تَرْكَنُوٓا إِلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا
فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِنْ أَوْلِيَآءَ ثُمَّ
لَا تُنصَرُونَ ﴿١١٣﴾ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ
ٱلَّيْلِ إِنَّ ٱلْحَسَنَٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ذَٰلِكَ ذِكْرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ
﴿١١٤﴾ وَٱصْبِرْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١١٥﴾ فَلَوْلَا
كَانَ مِنَ ٱلْقُرُونِ مِن قَبْلِكُمْ أُولُوا بَقِيَّةٍ يَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْفَسَادِ
فِي ٱلْأَرْضِ إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّنْ أَنجَيْنَا مِنْهُمْ وَٱتَّبَعَ ٱلَّذِينَ
ظَلَمُوا مَآ أُتْرِفُوا فِيهِ وَكَانُوا مُجْرِمِينَ ﴿١١٦﴾ وَمَا كَانَ
رَبُّكَ لِيُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا مُصْلِحُونَ ﴿١١٧﴾

**مەردانە خۆت ڕاگرە:**

﴿[112] فاستقم كما أمرت ومن تاب معك﴾ دەسا خۆتو ئەوانە لەگەڵ تۆدان و تەوبەیان لەشیرك و كردەوەی خراپكردووە، بەوجۆرە خوا فەرمانی پێكردون بەراست و ڕێك خۆڕاگرە ﴿ولا تطغوا﴾ و لەسنوورو یاسای خوا تێمەپەڕن ﴿إنه بما تعملون بصير﴾ چونكە هەركارو كردەوەیە دەكەن خوا دەیبینێ و دەیزانێ ﴿[113] ولا تركنوا إلى الذين ظلموا﴾ بەهیچ شێوەیەك مەیل مەكەن بۆلای ئەوانەی ستەمیان كردووە، واتە: پاڵیان پێوەمەدەن و پشتگیرییان لێ مەكەن و، بەكردەوەیان ڕازیی مەبن ﴿فتمسكم النار﴾ دەنا ئاگر ئەوقەتان ئەبێ و دەسووتێن. شێخی (بەیزاویی) لەمانای (ركون)دا دەڵێت: (هو الميل اليسير. أی لا تميلوا إليهم أدنى ميل فتمسكم النار بركونكم إليهم، وإذا كان الركون اليسير إلى من وجد منه ميل ما يسمى ظلما كذلك، فما ظنك بالركون إلى الظالمين الموصوفين بالظلم، والميل إليهم كل الميل) واتە: (ركون) بەكەمترین مەیل و پاڵ پێوەدان دەڵێن، جا ئەگەر مرۆڤ بەكەمترین مەیلدان بەلای موشریكان و زاڵمانەوە، بسووتێ و گیرۆدە ببێت، دەبێ حاڵی زاڵمان خۆیان و ئەوانەی وا بەتەواوی هاوكارییان دەكەن چۆن بێ؟ (قەتادە) ئەڵێ: مانای ئەم ئایەتە ئەوەیە كەناهەقكاران و ستەمكارانتان خۆش نەوێ و، بەقسەشیان مەكەن. كەوابوو چەندە بتوانرێ دەبێ ئەوەندە هاوڕێی و هاوكاری خەڵكی كافرو بیدعەچی نەكرێ. خۆ ئەگەر ناچار كراین هاكاریی و هاوڕییەتییان بكەین، ئەوە دەچێتە بابی (توقیە) و ناچارییەوەو ئەمیش كۆمەڵێ مەرجی هەیە، لە ئایەتی: (لايتخذ المؤمنون الكفرين أولياء)ی ئالی عیمران دا كورتەیەك بۆ ئەمە نووسراوە ﴿ومالكم من دون الله من أولياء﴾ و بێجگە لەخواش هیچ یارمەتی دەرێكتان بۆ نابێ لەوئاگرە دەرتان بێنێ ﴿ثم لا تنصرون﴾ پاشانیش سەرناخرێن بەسەر دوژمندا.

**بەباشی نوێژەكانت بكە:**

﴿[114] وأقم الصلاة طرفي النهار و زلفا من الليل﴾ لەهەردوو لای ڕۆژدا بەیانی و عەسرو لەچەند بەشێكی سەرەتایی شەودا شێوان و خەوتنان نوێژ بەجێ بهێنن ﴿إن الحسنات يذهبن السيئات﴾ چونكە بەڕاستیی چاكەكان كە نوێژیش بەشێكە لەوان خراپەكان ڕادەماڵن ﴿ذلك ذكرى للذاكرين﴾ ئەو نوێژوو لەخوا نزیك بوونەوەیە، یادەوەرییە بۆ ئەوانەی یادی خوا دەكەن ﴿[115] واصبر فإن الله لا يضيع أجر المحسنين﴾ و ئەی پێغەمبەر لەسەر گشت قۆرت و نارەحەتییەكانیش بەئارامبە، چونكە بەڕاستیی خوا پاداشی چاكەی چاكەكاران زایە ناكات، پێشەوا (ئەحمەد) ئەم فەرموودەیە دێنێ و دەڵێت: ((ما من مسلم يذنب ذنبا، فيتوضأ و يصلي ركعتين إلا غفر له))، واتە: هەر موسڵمانێك گوناحێ بكاو، پاشان دەسنوێژێ بگرێ و، دووركات نوێژ بكات، لەگوناحەكانی دەبووردرێت .

**دەبێ دەستەیە هەبن بۆ بەرەوانی لەهەق:**

﴿[116] فلولا كان من القرون من قبلكم﴾ ئەوە بۆ لەو هەمووخەڵكانەی بەر لەئێوە بوون ﴿أولوا بقية ينهون عن الفساد في الأرض﴾ چەند كەسانێكی ژیرو خاوەن هۆشی وانەبوو، ڕێگا بەفەسادو خراپەكاریی نەدەن لەوڵاتدا؟ ﴿إلا قليلا ممن أنجينا منهم﴾ بەڵام كەمێكیان ڕێی خێریان گرتەبەر، دەرفەتی فەسادكارییان نەداو، ئێمەیش لەسزا ڕزگارمان كردن، وەكو ئیماندارەكانی هەموو هۆزو ئوممەتەكان، كەواتە با لەناو ئێوەیشدا (ئەی قورەیش!) خەڵكێكی دڵسۆزی ئاوا هەبێ و، ڕێ لەخراپەكاری بگرێ، وە لەجێگایەكی تردا دەفەرموێ: (ولتكن منكم أمة يدعون إلى الخير ويأمرون بالمعروف وينهون عن المنكر..)، پێغەمبەریشمان موحەممەد ﷺ دەفەرموێ: ((إن الناس إذا رأوا المنكر فلم يغيروه، أوشك أن يعمهم الله بعقاب)) ئیبن ماجە: ١٣٢٧/٢. ﴿واتبع الذين ظلموا ما أترفوا فيه﴾ و ئەوانەی

ستەمكار بوون، شوێنی ئەو خۆشگوزەرانیە كەوتن و تێیدا مەست ببوون ﴿وكانوا مجرمين﴾ و چوو بوونە ڕیزی تاوانبارو گوناهكارانەوە بۆیە خوا لەناوی بردن ﴿١١٧ وما كان ربك ليهلك القرى بظلم﴾ پەروەردگارت نەیكردووە بەباو كە بەستەم شارو گوندەكان لەناو بەرێت ﴿وأهلها مصلحون﴾ و خەڵكەكەیشیان چاكساز بوو بن.

### خوا نەیویست گشت خەڵكی دنیا ئیمانداربن :

﴿١١٨ و لوشاء ربك لجعل الناس أمة واحدة﴾ ئەر پەروەردگارت ویستبای هەموو خەڵكی دنیای دەكردە یەك ئوومەت و یەككۆمەڵ و هەموو دیندارو موسڵمان دەبوون بەڵام لەبەر هەرحیكمەتێك كە خۆی دەیزانێ، ئەوكارەی بەوشێوە نەكرد، لەولایشەوە ئەگەر وای كردبا (جەبر) و زۆر ڕووی دەدا، ئیتر ئەوكاتەش پاداشت و تۆڵە نەدەبوو ﴿ولا يزالون مختلفين * ١١٩ إلا من رحم ربك﴾ بەڵام بەدرێژایی ڕۆژگار، هەر ناتەباو ناكۆك و لێك ترازاو دەبن و، لەسەر یەك بەرنامەو ئایین كۆ نابنەوە، مەگەر كەسێك پەروەردگارت بەزەیی پیا بێتەوەو، بیخاتە سەر ڕێگەی ڕاست و، لەو ناكۆكیی و هەراو كێشەیە دوور رایگرێت، دیارە ئەوكەسانە هەرگیز كێشە دروست ناكەن و لەناویەكدا ناكۆك نابن ﴿ولذلك خلقهم﴾ و لەبنەڕەتدا بۆئەوە دروستیكردون بكەونە بەر سۆزو میهرەبانی خۆیی و لەو دەستەو كۆمەڵەبن كەخوا میهرەبانی لەگەڵ كردوون و ناتەباو پەرتەوازە نەبوون ﴿وتمت كلمة ربك﴾ بڕیاری پەروەردگاریشت دەرچووەو فەرموویەتی: ﴿لأملأن جهنم من الجنة والناس اجمعين﴾ كە دەبێ دۆزەخ پڕ بكەم لە جنۆكەو بنیادەمە لارو لاسارەكان، ئەوانەیان كەشیاوی ئاگرن ﴿وكلا نقص عليك من أنباء الرسل مانثبت به فوءادك﴾ و هەواڵی ئەوهەموو پێغەمبەرو گەلانەیانت بۆ دەگێڕینەوە، هەتا دڵتی پێ بەهێز بكەین و دڵنیاشتكەین لەراستیی كارەكەت ﴿وجاءك فى هذه الحق﴾ دڵنیاشبە هەرچی بۆتهاتووە لەم سوورەتەدا هەق و ڕاستە ﴿و موعظة وذكرى للمؤمنين﴾ و پەندو ئامۆژگاریی و بیرخستنەوەشە بۆ بڕواداران ﴿١٢١ وقل للذين لا يؤمنون﴾ و بەو كەسانە بڕوا ناهێنن بڵێ: ﴿اعملوا على مكانتكم إنا عاملون﴾ ئێوە لەسەر كاروكردەوەی خۆتانبن و، هەرچیتان لە دەست دێ بیكەن، بێگومان ئێمەش لەسەر پەیڕەو و پرۆگرامی خۆمان هەوڵدەدەین و كار ئەكەین ﴿١٢٢ وانتظروا إنا منتظرون﴾ و ئێوە چاوەڕوانی سەرەنجامی ئێمە بكەن، ئێمەش چاوەڕوانی سەرەنجامی ئێوە دەكەین ﴿١٢٣ ولله غيب السموات والأرض﴾ وە زانینی هەموو شتێكی غەیب و نادیاری ئاسمانەكان و زەویی هەر بۆ خوایە، دەزانێ چیتان بەسەر دێ و چیش بۆ ئێمە ئەبێ ﴿وإليه يرجع الأمر كله﴾ و تەواوی كارو هەموو بڕیارێكیش هەر بۆلای ئەو دێتەوە ﴿فاعبده﴾ سا تۆش هەر ئەو بپەرستەو تابت و نەگۆڕاو بە ﴿وتوكل عليه﴾ و هەر بەویش پشت ببەستەو

الجزء الثاني عشر — سورة هود

وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ ٱلنَّاسَ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ ﴿١١٨﴾ إِلَّا مَن رَّحِمَ رَبُّكَ وَلِذَٰلِكَ خَلَقَهُمْ وَتَمَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿١١٩﴾ وَكُلًّا نَّقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِۦ فُؤَادَكَ وَجَآءَكَ فِي هَٰذِهِ ٱلْحَقُّ وَمَوْعِظَةٌ وَذِكْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٢٠﴾ وَقُل لِّلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ٱعْمَلُوا۟ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنَّا عَٰمِلُونَ ﴿١٢١﴾ وَٱنتَظِرُوٓا۟ إِنَّا مُنتَظِرُونَ ﴿١٢٢﴾ وَلِلَّهِ غَيْبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَإِلَيْهِ يُرْجَعُ ٱلْأَمْرُ كُلُّهُۥ فَٱعْبُدْهُ وَتَوَكَّلْ عَلَيْهِ وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿١٢٣﴾

سُورَةُ يُوسُفَ — مكية — ١٢ — آياتها ١١١

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓر تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴿١﴾ إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٢﴾ نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ ٱلْقَصَصِ بِمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ وَإِن كُنتَ مِن قَبْلِهِۦ لَمِنَ ٱلْغَٰفِلِينَ ﴿٣﴾ إِذْ قَالَ يُوسُفُ لِأَبِيهِ يَٰٓأَبَتِ إِنِّي رَأَيْتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَبًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ رَأَيْتُهُمْ لِي سَٰجِدِينَ ﴿٤﴾

٢٣٥

ئارامت هەبێ ﴿وما ربك بغافل عما تعملون﴾ وهەرگیز پەروەردگاریشت بێ ئاگاو خافڵ نییە لەهەرکارو کردەوەیك هەردوولاتان دەیکەن، واتە: ئێوەو ئەوان هەرچی بکەن خوا ئاگای لێیە.

لە ( ٢٢ )ـی شەوالی ( ١٤١٥ ) ك بەرامبەر بە ( ١٩٩٥/٣/٢١ ) ز لەم سوورەتە بوومەوە.

الحمد لله أولا وآخرا.

*** *** ***

## ١٢- سوورەتی ( یوسف )ـە

## مەککەییەو، ( ١١١ ) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

سوورەتی (یوسف) چیرۆك و داستانی (یوسف) دەگێڕێتەوە، بەتایبەت کە ئەوهەموو بەڵاو نەهامەتییەی لەلایەن براکانیی و، خەڵکانی ترەوە لەماڵی گەورەی میسرو، لەزیندان و لەنەخشەو پیلانی ژنەکاندا بەسەریا هات.. تا دەرەنجام خوای میهرەبان و دلۆڤان ڕزگاری کردوو بوویە نموونەی دڵپاکی و، داوێن پاکی بۆ تەواوی جیهان، بەتایبەت بۆلاوانی سەردەمی خۆی. زۆر بەئوسلووب و شێوازێکی ویژدان بزوێن دەست پێدەکات، وشەو بێژەو شێوەی گەیاندنی و، تام و چێژی گێڕانەوەی چیرۆکەکە، بەجۆرێکی وایە دەچێتە ناودڵەوە، هەرچۆنێ خوێن بەشادەمارەکاندا دەچێو دەگاتە نێودڵ ، هەر وەکو ڕۆح دەچێتە ناوجەستەو لاشەوە.. ئەم سورەتە هەرچەندەش مەککەیی یە، بەڵام شێوازێکی ناسك و نەرمی هەیە، میهرەبانیی و، ڕەحم و سۆز دەنوێنێ.. بۆیە زانایەك دەڵێت: سوورەتی (یوسف) و سوورەتی (مەریەم) لەدووبارەو سێ بارە کردنەوەیاندا بەهەشتییەکان تام و لەزەتیان لێوەردەگرن، (عەتا)یش دەڵێت: هەر مرۆیەکی خەفەتبارو دڵزویر سوورەتی (یوسف) ببیسێ ئەحەوێتەوە.

ئەم سوورەتە لەپاش سوورەتی (هوود)ـەوە هاتووە، هەر لەوساڵەدا کەهەردوو پاڵپشتەکەی پەیامبەر ﷺ (ئەبو تالیب و، خاتو خەدیجە) لەدونیا دەرچوون، وە لەبەر سەختی و نەهامەتیی و ڕووداوەکان تێیدا ناونرا بە (عام الحزن). جا ئالەو ماوە تاڵ و پڕ لەمیحنەت و ئەشکەنجەیەدا ئەم سوورەتە دێت بۆ دڵدانەوەی پەیامبەر ﷺ.. وەك پێی بفەرموێ: لە بڕوا نەهێنان و ئازاری قەوم و گەلەکەت بێ تاقەت مەبە، چونکە پاش هەموو ناڕەحەتییەك خۆشییە، وە لەدوای هەموو تەنگانەیەك فەرەحانەیە.. سەیری یوسفی برات بکە.. کە چۆن ئەوهەموو بەڵا جۆراو جۆرەی بەسەردا هات: هەر لەکێشەی براکانی و زیندان و، تاقیکردنەوەی ژنەکەی عەزیزو، ئەوین بازیی بۆیی و، ئەو فرت و فێڵ و حیلەیەی بۆی دارشت، بەڵام چونکە ئەو لەپێناوی بیرو باوەڕەکەیدا ڕاستبوو و ئارامی گرت.. خوای گەورەیش لەزیندانەوە بردی بۆ کۆشکی پاشایەتیی و، کردیشی بەگەورە پیاوی وڵاتی میسر.. جا هەرکەسێك بیەوێ ڕێی مەردان بگرێت، دەبێ صەبرو ئارامی ئەوانیشی هەبێ، ئەگینا ناگاتە ئەو سەروەریی و ڕێزو حورمەتە.. بۆیە پەیتا پەیتا بەپێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (فاصبر کما صبر أولوا العزم من الرسل) ٤٦/٣٥..یان دەفەرموێ: (واصبر وما صبرك إلا بالله، ولا تحزن علیهم ولا تك فی ضیق مما یمکرون) ١٦/١٢٧ .بەڵێ: بەکورتیی: کەش وهەوای ئەم سوورەتە دڵدانەوەیە بۆ پەیامبەر ﷺ، و هەروا بۆ کاروانی موجاهیدان و، ڕاساڵان و، ڕاستگۆیان و، چاکان و، پاکان تارۆژی قیامەت.

الله، ابن نبی الله، ابن نبی الله ابن خلیل الله))، قالوا لیس عن هذا نسألك. ((قال: فعن معادن العرب تسألونی؟))، قالوا: نعم. ((قال: فخیارکم فی الجاهلیة، خیارکم فی الإسلام إذا فقهوا) واتە: لە پێغەمبەریان ﷺ پرسی: چ کەسێ بەڕێز ترە؟ فەرمووی: بەرزترینی خەڵك لای خوا، خۆ پارێزترینانە، وتیان: ئێمە لەوە ناپرسین! فەرمووی: جا پایەبەرزتری هەموو مرۆڤەکان (یوسف)ی پێغەمبەری، کوڕی پێغەمبەری، کوڕی پێغەمبەری، کوڕی خۆشەویستی خوایە). وتیان: لەوەیش ناپرسین! فەرمووی: ئەی لەبنەڕەت و ڕشتەی عەرەب دەپرسن؟ وتیان: بەڵێ. فەرمووی: کێیان لەسەردەمی نەفامیدا باشبووە، ئێستایش لەنێو ئیسلامدا هەرئەو کەسە باشە، بەومەرجە لەم ئایینی ئیسلامە تێبگا.

الجزء الثاني عشر | سورة يوسف

قَالَ يَٰبُنَيَّ لَا تَقۡصُصۡ رُءۡيَاكَ عَلَىٰٓ إِخۡوَتِكَ فَيَكِيدُواْ لَكَ كَيۡدًاۖ
إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ لِلۡإِنسَٰنِ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ٥ وَكَذَٰلِكَ يَجۡتَبِيكَ
رَبُّكَ وَيُعَلِّمُكَ مِن تَأۡوِيلِ ٱلۡأَحَادِيثِ وَيُتِمُّ نِعۡمَتَهُۥ عَلَيۡكَ
وَعَلَىٰٓ ءَالِ يَعۡقُوبَ كَمَآ أَتَمَّهَا عَلَىٰٓ أَبَوَيۡكَ مِن قَبۡلُ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡحَٰقَۚ
إِنَّ رَبَّكَ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ٦ ۞ لَّقَدۡ كَانَ فِي يُوسُفَ وَإِخۡوَتِهِۦٓ
ءَايَٰتٞ لِّلسَّآئِلِينَ ٧ إِذۡ قَالُواْ لَيُوسُفُ وَأَخُوهُ أَحَبُّ إِلَىٰٓ
أَبِينَا مِنَّا وَنَحۡنُ عُصۡبَةٌ إِنَّ أَبَانَا لَفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ٨ ٱقۡتُلُواْ
يُوسُفَ أَوِ ٱطۡرَحُوهُ أَرۡضٗا يَخۡلُ لَكُمۡ وَجۡهُ أَبِيكُمۡ وَتَكُونُواْ مِنۢ
بَعۡدِهِۦ قَوۡمٗا صَٰلِحِينَ ٩ قَالَ قَآئِلٞ مِّنۡهُمۡ لَا تَقۡتُلُواْ يُوسُفَ
وَأَلۡقُوهُ فِي غَيَٰبَتِ ٱلۡجُبِّ يَلۡتَقِطۡهُ بَعۡضُ ٱلسَّيَّارَةِ إِن كُنتُمۡ
فَٰعِلِينَ ١٠ قَالُواْ يَٰٓأَبَانَا مَا لَكَ لَا تَأۡمَ۬نَّا عَلَىٰ يُوسُفَ وَإِنَّا لَهُۥ
لَنَٰصِحُونَ ١١ أَرۡسِلۡهُ مَعَنَا غَدٗا يَرۡتَعۡ وَيَلۡعَبۡ وَإِنَّا لَهُۥ
لَحَٰفِظُونَ ١٢ قَالَ إِنِّي لَيَحۡزُنُنِيٓ أَن تَذۡهَبُواْ بِهِۦ وَأَخَافُ
أَن يَأۡكُلَهُ ٱلذِّئۡبُ وَأَنتُمۡ عَنۡهُ غَٰفِلُونَ ١٣ قَالُواْ لَئِنۡ
أَكَلَهُ ٱلذِّئۡبُ وَنَحۡنُ عُصۡبَةٌ إِنَّآ إِذٗا لَّخَٰسِرُونَ ١٤

حزب ٢٤

٢٣٦ | فلما ذهبوا به

**بابی ئامۆژگاری یوسف دەکا لەبارەی خەونەکەیەوە:**

﴿[5] قال یا بنی لا تقصص رؤیاك علی إخوتك﴾ یەعقووبی باوکی وتی: کوڕە چکۆلەکەم ئەم خەوەت بۆ براکانت مەگێڕەوە ﴿فیکیدوا لك كیدا﴾ نەوەکو فێڵێکت لێ بکەن و داوێکت بۆ بنێنەوە، چونکە خەوەکەت ئاییندەیەکی باشی لێوە دیارە ﴿إن الشیطان للإنسان عدو مبین﴾ چونکە شەیتان بۆ بنیادەم دوژمنێکی ئاشکرایە، دەتۆش زۆر وریابە، نەوەك براکانت لێهان بدات.

**یوسف فێری لێدانەوەی مانای خەون بوو:**

﴿[6] وکذلك یجتبیك ربك﴾ هەروەك پەروەردگارت ئەو خەوەی نیشان دایت، هەر ئاوایش هەڵت ئەبژێرێ بۆ پەیامبەرێتیی ﴿ویعلمك من تأویل الأحادیث﴾ و مانا و مەبەستی خەونەکانیشت فێردەکات چۆن لێکیان بدەیتەوەو چارەسەریان بۆدابنێیت ﴿ویتم نعمته علیك وعلی آل یعقوب﴾ و دەربارەی تۆو هەموو بنەماڵەکەی (یەعقووب)یش نازونیعمەت و بەخششی خۆی (پلەی پێغەمبەر یّتیتان) بۆ تەواودەکا ﴿کما اتمها علی ابویك من قبل إبراهیم وإسحاق﴾ هەروەکو ئەوپلەو پایەیەی بەسەر باپیرانت (ئیبراهیم) و (ئیسحاق) لەپێش باوکتدا تەواوکرد ﴿إن ربك علیم حکیم﴾ بێگومانبە پەروەردگارت زۆر زانایە، زۆریش لەکارزان و کارجوانە"چاك دەزانێ چی دەکات، لەبەرچی دەیکا.

**سەرگروشتەی یوسف نیشانە گەلێکی تێدایە:**

﴿[7] لقد کان فی یوسف وإخوته آیات للسائلین﴾ بێگومان لەبەسەر هاتی یوسف و براکانیدا گەلێك بەڵگەوپەندی گرنگ هەیە بۆئەوانەی لەو ڕووداوە دەپرسن ﴿[8] إذ قالوا لیوسف واخوه﴾ کاتێ براکانی یوسف بەبۆچوونی خۆیان وتیان: ئەمە سوێندی بێت (یوسف) و (بنیامین)ی برای ﴿أحب إلی ابینا منا﴾ لای بابمان لەئێمە خۆشەویسترە! چونکە خەونەکەیان بیستبوو و، دەیانزانی دەبێتە مایەی زێدە ڕێزو حورمەت بۆی لای بابی ﴿ونحن عصبة﴾ خۆ ئێمە دەستەو کۆمەڵە پیاوێکین هەق وایە دڵ بەئێمە بدات، هەتا ئەوان ﴿إن أبانا لفی ضلال مبین﴾ بێگومان لەمەدا

باوكمان كەوتۆتە ناوهەڵەیەكی روون و ئاشكراوە، (ئیبن كەسیر) دەڵێ: بەڵگەیەكی قسەبڕو یەكلاكەرەوە نییە كە: براكانی (یوسف) پێغەمبەر بوون. ﴿٩ اقتلوا یوسف﴾ لەنێو خۆیاندا بڕیاریانداو گوتیان: چار هەرئەوەیە بیكوژن!! ﴿او اطرحوه ارضا﴾ یان فڕەیدەنە شوێنێكی چۆڵ و بیابانەوە ﴿یخل لكم وجه ابیكم﴾ ئەوكاتە سەرنج و ڕووی باوكتان یەكلا دەبێتەوە بۆتان و، ڕوو هەر بەئێوە ئەدات ﴿وتكونوا من بعده قوما صالحین﴾ وە دوای یوسف تەوبە دەكەن و، دەبنە پیاوچاك و، گیروگرفتیشتان نامێنێت ﴿١٠ قال قائل منهم﴾ قسەكەرێكیان وتی:﴿لا تقتلوا یوسف﴾ لەدژایەتی (یوسف)دا، مەگەنە ئەوسنوورە بیكوژن ﴿والقوه فی غیابت الجب﴾ وە بیهاوێنە ناو بێخی بیرێكی قووڵەوە، دیارە خوای گەورە كارێكی زۆر گرنگی پێیەتی، بۆیە ئەو كەسەیان لەوێ ڕاست دەبێتەوەو، ئەو ڕایە پێشنیاز دەكاو لێیشی قبووڵ دەكەن ﴿یلتقطه بعض السیارة﴾ ئەوسا بۆدوایی هەندێ كاروانچی دەچنە سەر بیرەكەو دەری دێنن و هەڵی دەگرن، ئێوە رزگاردەبن و ئەویش ناكوژرێت ﴿إن كنتم فاعلین﴾ ئەر هەر ئەتانەوێ ئەو كارە بكەن. (ئیبن ئیسحاق) دەڵێت: كارێكی زۆر دڵڕەقانەیان كرد بەرامبەر بە یوسف، چونكە گوێیان بەبرایەتیی و،خۆشەویستی ئەولاوە شۆخ و شەنگە نەداو، بیریێكیان لەو ئازارو بێزارە نەكردەوە دەچێتە دڵی ئەو (یەعقووب)ـە پیرەساڵەی بابیانەوە!

**بەناوی سەیرو سەفاوە یوسف لەگەڵ خۆیان دەبەن:**

﴿١١ قالوا یا ابانا﴾ ئەوجا بۆ ئەنجامدانی پیلانەكەیان، هاتنەلای بابیان و وتیان: بابە!﴿مالك لا تأمنا علی یوسف﴾ بۆچی بەدەستپاك و ئەمینمان دانانێت سەبارەت بەیوسف؟! ﴿وإنا له لناصحون﴾ بێگومانبە ئێمە دڵسۆزو خێرخوازین بۆی ﴿١٢ ارسله معنا غدا﴾ دەساسبەینێ لەگەڵمان بینێرە بۆ دەشت ﴿یرتع و یلعب﴾ با بۆخۆی چی پێخۆشە بیخوات و، گەمەو یاریش بكات ﴿وإنا له لحافظون﴾ دڵنیایشبە ئێمە پارێزگاری ئەوین و دەیپارێزین، كەوابوو زوو تەسلیممانی بكەو،لەهیچ شتێك مەترسە ﴿١٣ قال إنی لیحزننی ان تذهبوا به﴾ یەعقووب وتی: بێ سۆ زۆر خەفەتبار دەبم بەبردنەكەی، واتە: تواناو وزەی فیراقیم نییە! ﴿واخاف ان یأكله الذئب﴾ دەشترسم گورگ بیخوا ﴿وانتم عنه غافلون﴾ و ئێوەیش گوێی نەدەنێ و ئاگاتان لێ نەبێ، ئەوجا كوڕەكانیش ئەوقسەیان لەدەم بابیان قۆزتەوەو، بۆدوایی كردیانە دەسپێكی خۆیان بۆفەوتانی یوسف ﴿١٤ قالوا لئن اكله الذئب﴾ وتیان: جائەگەر گورگ خواردیی ﴿ونحن عصبة﴾ و ئێمەیش كۆمەڵە پیاوێكی بەهێزی واین ﴿إنا إذا لخاسرون﴾ دیارە ئێمە زیاندیدەو زیانبارین، كەواتە: هەرگیز شتی وا ڕوو نادات و نابێت، بەڵێ پاش ئەوهەموو ئاگر بەسە بۆئیشەكانیان ، بابیان بە ناچاریی قەناعەت دەكاو قایەلدەبێت كە لەگەڵخۆیاندا بیبەن.

**یوسف خرایە بن بیرەكەوە:**

﴿١٥ فلما ذهبوا به﴾ جاكاتێ لەگەڵ خۆیان بردیان، ئەو هەموو قسەو ئاگر بەسەیان شكاندو، خەیاڵی خراپیانكرد بەرامبەری، بۆیە دەفەرموێ: ﴿واجمعوا ان یجعلوه فی غیابت الجب﴾ و ئیتر هەموو لێبڕان و، بەیەكدەنگ رایان هاتە سەر ئەوە كە: بەگەلە كۆمەكی بیخەنە بن بیرەكەوە، (سەدیی) دەڵێت: بەستیان بەپەتێكەوەو، دایانكێشایە خوارەوە، جاهەر كەدەستی رادەكێشا بۆلای یەكێكیان -بەڵكە رەحمی پێبكات بەزللە پیایا دەهات، كاتێ لەلێواری بیرەكەیشدا دەستی دەئاڵان بەبەرۆكی هەر كامێكیاندا، خێرا دەیاندا

بەدەستیبیا، پاشان لەنیوەی بیرەکەدا پەتەکەیان بڕیی و، کەوتە بنی بیرەکەوەو، ئاو دایپۆشی و ئەوجا
هەڵسایەوەو پەلاماریداو چوویە سەر بەردێك کە لەناوەڕاستی بیرەکەدا بووو، لەسەریەوە خۆیگرتەوە! ئالەو
حالە بێحالەدا خوا فەرمووی: ﴿واوحينا إليه﴾ ئەوسا ئێمەش وەحیی و سروشمان بۆ یوسف کرد
وتێمانگەیاند ﴿لتنبئنهم بأمرهم هذا﴾ کە بەڕاستیی ڕۆژێ دێت تۆ ڕزگارت دەبێ و، ئەوان بەمکارە
ناڕەوایەیان -کە بەرامبەر تۆ کردیان- ئاگادار دەکەیتەوە ﴿وهم لا يشعرون﴾ وهەستیش ناکەن و، تۆ
ناناسنەوەو، نازانن تۆ (یوسف)یيت.

**لای بابیان تاوانەکەیان پینە دەکەن:**

﴿[١٦] وجاءوا وأباهم عشاء يبكون﴾ ئەوکارەیان کردو، پاشان شەو درەنگانێك بەکوڵی گریانەوە بۆ لای باوکیان هاتنەوە، جا یەعقوب وتی: چی قەوماوە! یوسف کوا ؟ ﴿[١٧] قالوا يا أبانا إنا ذهبنا نستبق﴾ وتیان: بابە! بەڕاستیی ئێمە ڕۆشتین غار غارێن و پێشبڕکێ بکەین ﴿وتركنا يوسف عند متاعنا﴾ و یوسفیشمان لای کەل و پەلەکانمان بەجێ هێشت ﴿فاكله الذئب﴾ ئەوجا گورگ پەلاماری دایەو خواردی!! ﴿وما انت بمؤمن لنا﴾ وە تۆ قەت بڕوامان پێناکەیت ﴿ولو كنا صادقين﴾ هەرچەندە ڕاستگۆیش بین، چونکە بەگومانی لێمان، جا نەخوازەڵلا ئێستاش کەیوسف بێسەرو شوێنە ﴿[١٨] وجاءوا على قميصه بدم كذب﴾ کراسەکەشیان بەخوێنێکی درۆینەوە بۆ هێنا، بەرخێکیان سەر بڕی و، کراسەکەیان تێهەڵکێشا، بەلام لەبیریان چوو بیشیدڕێنن، بۆیە بابیان باوەڕی پێنەکردن ﴿قال بل سولت لكم انفسكم امرا﴾ گوتی: نەخێر باوەڕناکەم شتی وا بووبێ، بەڵکو من بەلامەوە وایە کەهەواو نەفستان شتێکی تری بۆ شیرین کردوون، واتە: بەدەر لەوە بەمنتانگوت شتێکی ترتان ئەنجامداوە، بۆیە گوتی: ﴿فصبر جميل﴾ چارەی من " لەبەرامبەر ئەو ڕووداوە تاڵەوە" هەر صەبرو ئارامیێکی جوان و بێ سکاڵاو بێ قەرارییە، سەبرێکی وا شایستەی پلەوپایەی پێغەمبەرێتی بێت ﴿والله المستعان على ما تصفون﴾ هەر خواش داوای یارمەتی لێدەکرێ بۆ هەڵگرتنی ئەو بەلایەی ئێوە وەسفی دەکەن و دەیلێن.

الجزء الثاني عشر — سورة يوسف

فَلَمَّا ذَهَبُوا بِهِ وَأَجْمَعُوا أَن يَجْعَلُوهُ فِي غَيَابَتِ الْجُبِّ وَأَوْحَيْنَا
إِلَيْهِ لَتُنَبِّئَنَّهُم بِأَمْرِهِمْ هَذَا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿١٥﴾ وَجَاءُوا
أَبَاهُمْ عِشَاءً يَبْكُونَ ﴿١٦﴾ قَالُوا يَا أَبَانَا إِنَّا ذَهَبْنَا نَسْتَبِقُ
وَتَرَكْنَا يُوسُفَ عِندَ مَتَاعِنَا فَأَكَلَهُ الذِّئْبُ وَمَا أَنتَ
بِمُؤْمِنٍ لَّنَا وَلَوْ كُنَّا صَادِقِينَ ﴿١٧﴾ وَجَاءُوا عَلَى قَمِيصِهِ
بِدَمٍ كَذِبٍ قَالَ بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ أَنفُسُكُمْ أَمْرًا فَصَبْرٌ جَمِيلٌ
وَاللَّهُ الْمُسْتَعَانُ عَلَى مَا تَصِفُونَ ﴿١٨﴾ وَجَاءَتْ سَيَّارَةٌ فَأَرْسَلُوا
وَارِدَهُمْ فَأَدْلَى دَلْوَهُ قَالَ يَا بُشْرَى هَذَا غُلَامٌ وَأَسَرُّوهُ بِضَاعَةً
وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴿١٩﴾ وَشَرَوْهُ بِثَمَنٍ بَخْسٍ
دَرَاهِمَ مَعْدُودَةٍ وَكَانُوا فِيهِ مِنَ الزَّاهِدِينَ ﴿٢٠﴾ وَقَالَ
الَّذِي اشْتَرَاهُ مِن مِّصْرَ لِامْرَأَتِهِ أَكْرِمِي مَثْوَاهُ عَسَى
أَن يَنفَعَنَا أَوْ نَتَّخِذَهُ وَلَدًا وَكَذَلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي
الْأَرْضِ وَلِنُعَلِّمَهُ مِن تَأْوِيلِ الْأَحَادِيثِ وَاللَّهُ غَالِبٌ عَلَى
أَمْرِهِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢١﴾ وَلَمَّا بَلَغَ
أَشُدَّهُ آتَيْنَاهُ حُكْمًا وَعِلْمًا وَكَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ ﴿٢٢﴾

٢٣٧

**یوسف لەبیر دەر هێنراو وەکو کالا فرۆشرا!**

﴿[١٩] وجاءت سيارة﴾ جا دوای ماوەیەك کاروانێك لە(شام)ـە وە هات بچێت بۆ(میسر)و لەو ناوەدا
پێویستیان بەئاو بووو چوونە سەر بیرەکە ﴿فأرسلوا واردهم﴾ و ئاو هەڵگۆزەکەیانیان نارد ئاویان بۆ

دەربێنێ ﴿فأدلى دلوه﴾ ئەویش سەتڵەکەیی داهێشتە بیرەکەوە، کاتێ هەڵیکێشایەوەو ئەو لاوەیەی دیت، سەری سوڕما، بۆیە ﴿قال یا بشرى هذا غلام﴾ وتی: موژدە بێت! ئەمە تازە لاوێکی جوان و ئێسک سووکە لەمبیرەدا بووە ﴿واسروه بضاعة﴾ براکانی، یان ئەو خەڵکەی دەورو بەرە دەنگوباس و بەسەرهاتەکەی (یوسف)یان شاردەوەو، کردیانە کاڵاو کەل و پەلێك بۆفرۆشتن! ﴿والله علیم بما یعملون﴾ وە خوا بۆخۆی بەئاگاو زانابوو بەوەی دەیانکرد ﴿[٢٠] وشروه بثمن بخس دراهم معدودة﴾ وە بەنرخێکی زۆر کەم و هەرزان، لەبازاڕی کۆیلە فرۆشەکانی میسردا یووسفیان بەچەند درەمێکی کەم فرۆشت ﴿وکانوا فیه من الزاهدین﴾ و لەفرۆشتنەکەیشیدا زۆردنیا ویست نەبوون و گوێیان نەدایە، هەر ویستیان لەکۆڵیان بێتەوە نەوەك ئاشکرا بێت.

## یوسف دەگاتە ماڵی پاشای میسر:

بەڵێ ئەوان هەر ویستیان لەدەستیان بێتەوە،خوایش کاری پێیەتی، بۆیە هەر لە یەکەم رۆژەوە قادرمەی بۆدادەنێت هەتا وردە وردەو لەسەرخۆ سەرکەوێت، بۆیە دەیخاتە دەستی وەزیری گەورەی میسرەوەو دەبێ حورمەت و رێزیشی بگرن، وەکو دەفەرموێ: ﴿[٢١] وقال الذی اشتراه من مصر لامراته﴾ وە ئەو کەسەی لەمیسردا یوسفی کڕیی (کە پاشاو عەزیزی میسر بوو) بە ژنەکەی خۆی وت: ﴿اکرمی مثواه﴾ رێزی بگرە و شوێن و جێگەی باش و شیاوی بۆ ئامادە بکە ﴿عسى ان ینفعنا او نتخذه ولدا﴾ سا بەڵکو قازانج و کەڵکێکمان پێ بگەیەنێت، یان"کەئێمە منداڵمان نییە" بیکەینە کوڕی خۆمان، لەڕاستییدا خوا خۆی ئەوگشت پلانە رێك دەخات بۆ یوسف. (ئەبوئیسحاق) لە (ئیبن مەسعوود)ـەوە دەڵێت: زرنگترینی مەردم ئەم سێ کەسەیە: یەکەم: (عەزیز)ی میسر کە بەژنەکەی گوت : رێزی یوسف بگرە! بێئەوەش بزانێ پایەو پلەی چییە. دووەم: ئەو کیژۆڵە کە بەبابی گوت: (یاابت إستئجره..). سێ یەم: (ئەبووبەکر) کە پاش خۆی (عومەر)ی هەڵبژاردو کردییە خەلیفەی موسڵمانان. ﴿وکذلك مکنا لیوسف فی الأرض﴾ وە ئاوا ئەم پایەو مەکانەتەمان پێدا ئاوایش قورسایی و دەسەڵاتمان بۆ یوسف لەمیسر جێگیر کرد ﴿ولنعلمه من تأویل الأحادیث﴾ وە بۆ ئەوەی فێریشی بکەین چۆن مانای خەون و ڕووداوەکان لێك بداتەوەو، شارەزای چارەسەری گرفتەکانی بکەین ﴿والله غالب على امره﴾ خوای گەورەیش بەسەر گشت کارەکانی خۆیدا زاڵ و بەدەسەڵاتە ﴿ولکن اکثر الناس لایعلمون﴾ بەڵام زۆربەی خەڵکی ئەمە نازانن و، لەحیکمەتی کارەکانی تێناگەن ﴿[٢٢] ولما بلغ اشده﴾ جا کە پێگەیشت و، بەتەواوی عەقڵ و هێزی پەیدا کردو، بەدەسەڵات و توانای لاوێتی خۆی گەیی ﴿آتیناه حکما وعلما﴾ پلەی پێغەمبەرێتیی و زانست و زانیاریی تێرو تەسەلمان دایە ﴿وکذلك نجزی المحسنین﴾ وە ئێمە هەموو کاتێ ئاوا پاداشتی چاکەکاران ئەدەینەوە.

## ژنەکەی عەزیزی میسر تەماح دەکاتە یوسف!

﴿[٢٣] و راودته التی هو فی بیتها عن نفسه﴾ جائەو ئافرەتەی کە یوسف لەماڵیا بوو هەوڵێکی زۆری لەگەڵدا هەتا رامی بکاو لەگەڵیا جووت ببێ! لەوە دەچێت -وەك ئەڵێن- تەمەنی عەزیز لەو سەردەمەدا لەچل ساڵ کەمتر نەبووبێت و، ژنەکەیشی نزیکەی سی ساڵێك بووبێت، وەیان تەمەنی ژنەکەی لە چل ساڵی دا بووبێت و تەمەنی (یوسف)یش دەورووبەری بیست و پێنج ساڵ بووبێت ﴿وغلقت الأبواب﴾ وە بەو نیازەوە تەواوی دەرگاکانی لەیوسف

وَرَٰوَدَتۡهُ ٱلَّتِي هُوَ فِي بَيۡتِهَا عَن نَّفۡسِهِۦ وَغَلَّقَتِ ٱلۡأَبۡوَٰبَ
وَقَالَتۡ هَيۡتَ لَكَۚ قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ رَبِّيٓ أَحۡسَنَ مَثۡوَايَۖ
إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ٢٣ وَلَقَدۡ هَمَّتۡ بِهِۦۖ وَهَمَّ بِهَا
لَوۡلَآ أَن رَّءَا بُرۡهَٰنَ رَبِّهِۦۚ كَذَٰلِكَ لِنَصۡرِفَ عَنۡهُ ٱلسُّوٓءَ
وَٱلۡفَحۡشَآءَۚ إِنَّهُۥ مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُخۡلَصِينَ ٢٤ وَٱسۡتَبَقَا
ٱلۡبَابَ وَقَدَّتۡ قَمِيصَهُۥ مِن دُبُرٖ وَأَلۡفَيَا سَيِّدَهَا لَدَا ٱلۡبَابِۚ
قَالَتۡ مَا جَزَآءُ مَنۡ أَرَادَ بِأَهۡلِكَ سُوٓءًا إِلَّآ أَن يُسۡجَنَ أَوۡ عَذَابٌ
أَلِيمٞ ٢٥ قَالَ هِيَ رَٰوَدَتۡنِي عَن نَّفۡسِيۚ وَشَهِدَ شَاهِدٞ مِّنۡ
أَهۡلِهَآ إِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن قُبُلٖ فَصَدَقَتۡ وَهُوَ مِنَ
ٱلۡكَٰذِبِينَ ٢٦ وَإِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٖ فَكَذَبَتۡ وَهُوَ
مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ٢٧ فَلَمَّا رَءَا قَمِيصَهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٖ قَالَ إِنَّهُۥ
مِن كَيۡدِكُنَّۖ إِنَّ كَيۡدَكُنَّ عَظِيمٞ ٢٨ يُوسُفُ أَعۡرِضۡ عَنۡ
هَٰذَاۚ وَٱسۡتَغۡفِرِي لِذَنۢبِكِۖ إِنَّكِ كُنتِ مِنَ ٱلۡخَاطِـِٔينَ
٢٩ ۞ وَقَالَ نِسۡوَةٞ فِي ٱلۡمَدِينَةِ ٱمۡرَأَتُ ٱلۡعَزِيزِ تُرَٰوِدُ فَتَىٰهَا
عَن نَّفۡسِهِۦۖ قَدۡ شَغَفَهَا حُبًّاۖ إِنَّا لَنَرَىٰهَا فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ٣٠



بەست و، تۆکمەو مەحکەمی کردن ﴿وقالت هیت لك﴾ و وتی: من خۆم بۆ تۆ ئامادە کردووە و، تۆش زۆر بەپەلە وەرە پێشێ و ئامادە بە ﴿قال معاذ الله﴾ یوسفیش داواکەی ڕەتکردەوەو وتی: پەنا بەخوا دەگرم، هەرگیز کاری ئاوا ناکەم ﴿إنه ربی احسن مثوای﴾ چونکە بەڕاستیی مێردەکەی تۆ گەورەو ئاغای من جوان ڕێزی لێگرتووم و، پیاوەتیی زۆرە بەسەرمەوە، دەبێ جوامێرانە سەیری ماڵ و خانەوادەی بکەم ، نەك خیانەت وگزیی لێبکەم، لەولایشەوە بەزاندنی سنووری خوایەو، کاری ستەمکارانە ﴿إنه لا یفلح الظالمون﴾ خۆ بەڕاستیی خەڵکانی ستەمکارو لەسنوور دەرچوو، هەرگیز سەرکەوتووو بەختیار نابن ﴿[24] ولقد همت به﴾ ئەمە سوێندی بێت شاژن بەتەواوی نیازی خراپی بە (یوسف) کردو، بەتەواوی لێبڕاو بڕیاریدا کە: ئەو کارەی لەگەڵ بکات، بۆیە پەلاماری دایە! ﴿وهم بها لولا ان رای برهان ربه﴾ (یوسف)یش گیری خوارد بەدەستیەوەو ئامۆژگارییەکی زۆری کرد، بەلام هەر وازی لێنەهێنا، خۆئەر بەڵگەو نیشانەیەکی پەروەردگاری نەهاتبایە پێش چاوی، دووچاردەبوو، بەڵام خوا پەنایدا لەو کارە نەشیاوە، دیارە سروشتی هەموو ئادەمزادە بڕوادارەکان هەر وایە, کاتێ کە ئارەزووی نەفسیی زۆریان بۆ دەهێنێ، لەو کاتە تەنگانەو ناسکەیەدا نووری خوایی بۆ هەڵدەکرێ و، دوور ئەکەوێتەوە لێی. لەم جێگایەدا گەلێ لەراڤەکەرانی قورئان –بە دڵپاکیی خۆیان– بەهەڵەدا چوون! چونکە گەلێ بۆچوونی نەگونجاوو ناڕەوایان لەتەفسیرەکانیاندا لەبەرامبەر (وهم بها)ی یوسفەوە نووسیوە، کەهیچ ئەسڵ وبنەمایەکی متمانە پێکراوو پشتگیرێکیان نیە لە (کتاب) و(سنة)دا, وە ئەو بۆچوونانە دژو ناکۆکن لەگەڵ دەقەکاندا. بەلام هەندێکیان وەك (ئەبو سعوود ، سەید قوتب..) رەدیان ئەدەنەوەو دەڵێن: هەر لەقورئاندا دە بەڵگە هەیە لەسەر پاکی یوسف عليه السلام، لەوانە: ئایەتی: (قال معاذالله، إنه ربی أحسن مثوای ..) هەتا ئایەتی: (قالت امرأة العزیز الآن حصحص الحق، أنا راودته عن نفسه وإنه لمن الصادقین). (ئیبن کەسیر)یش لە(بەغەویی)یەوە دەڵێ: ئەو(هم بها)ی یوسفە تەنها خەتەرەو خۆرپەیەکی (نەفس) بوو و، خێرا سەرکوتی کردو زاڵبوو بەسەریا. هەندێکیش دەڵێن: (هم بها) واتە: ویستی لێیبدات، یان سیماو نیگاری (یەعقووب)ی بابی دیت، یان فریشتەیەکی دیت و راچڵەکاو دوورتر کەوتەوە لە شاژن، بەلام لەگەڵ ئەم گشت بۆچوونانەشدا چاك وایە ئەو (برهان ربه) دیاریی نەکرێت ﴿کذلك لنصرف عنه السوء والفحشاء﴾ ئا بەو شێوەیە بەهۆی ئیمانی دامەزراویەوە لەبەردەم ئەو کارە زۆرخراپەدا خۆی راگرت بۆ ئەوەی لەئاییندەشدا لەهەموو خراپەو کارێکی ناشیاوو دزێو لای بدەین ﴿إنه من عبادنا المخلصین﴾ چونکە ئەو (یوسف) بەندەیەك بوو لەبەندە پاك و هەڵبژێر راوەکانی خۆمان ﴿[25] واستبقا الباب﴾ سەرەنجام هەردوو بەراکردن گەیشتنە لای دەرگاکە، یوسف بۆ هەڵهاتن و خۆ قوتارکردن، شا

ژنیش بەدوای ئارەزووی خۆیدا ﴿وقدت قميصه من دبر﴾ و جالەو هەڵهاتنەدا شاژن توانی لەدواوە دەستی گیر بکا لەکراسەکەی یوسف و دڕانی ﴿والفيا سيدها لدى الباب﴾ جاهەردوو کت و مت لەدەم دەرگاکەدا تووشی مێردەکەی هاتن ﴿قالت ما جزاء من اراد بأهلك سوء﴾ جا بۆ ئەوەی ڕاستییەکە دەر نەکەوێ، شا ژن بەپەلە وتی: ئاخۆ تۆڵەی ئەوکەسە چی بێ کەنیازی پیاوخراپی لەگەڵ ماڵ و خێزانی تۆدا بکا؟! ﴿إلا أن يسجن اوعذاب اليم﴾ غەیرەز ئەمە یەکێ لەم دووشتەی لەگەڵ بکرێ: یابخرێتە بەندیخانەوە، یا بەسزایەکی ئێش پێگەیەنەر سزا بدرێ ؟! ﴿[٢٦] قال هي راودتني عن نفسي﴾ (یوسف)یش دەکەوێتە پاکانە بۆ خۆیی و، درکاندنی ڕاستییەکە، بۆیە وتی: نەخێر وانیە، ئەو هەوڵێکی زۆریدا بۆ ڕامکردن و لەخشتە بردنی من بۆ ئەوکارە ناپەسەندەو، هەر بەزۆریش بۆلای خۆی بانگی کردم و، منیش ڕەفزم کردو هەڵهاتم ، ئەویش بەدوامدا ڕایکرد، هەتا لەم دەرگایەدا بەتۆ گەیشتین و کراسەکەیشی دڕاندم! ﴿وشهد شاهد من أهلها﴾ وە شایەتێك لەخزمانی شاژن هەڵیدایەو شایەتی داو وتی: ﴿إن كان قميصه قد من قبل﴾ ئەگەر کراسەکەی یوسف لە پێشەوە دڕابێ ﴿فصدقت﴾ ئەوا شاژن ڕاستدەکات ﴿وهو من الكاذبين﴾ و یوسف لەدرۆزنانە، واتە: یوسف پەلاماری ئەوی داوەو ئەویش هەڵهاتووەو ڕایکردووە لەدەستی و ئەمیش لەپێشەوە دەستی لەکراسەکەی گیر کردووەو دڕاندوویەتی ﴿[٢٧] وإن كان قميصه قد من دبر﴾ خۆئەر کراسەکەشی لەپشتەوەدا دڕابوو، ﴿فكذبت﴾ ئەوا شاژن درۆ دەکات ﴿وهو من الصادقين﴾ و (یوسف) ڕاست دەکات، واتە: ژنەکە پەلاماری یوسفی داوەو یوسف هەڵهاتووەو ڕایکردووە لەدەستی و ئەویش لەپشتەوە دەستی لە کراسەکەی گیرکردووەودڕاندویەتی. ﴿[٢٨] فلما رءا قميصه قد من دبر﴾ جا کاتێ کەشای (مێردی زلێخا) دیتی کراسەکەی (یوسف) لە پشتەوە دڕاوە ﴿قال إنه من كيدكن﴾ وتی: بەڕاستیی ئەوکارە هەر لەپیلان و فرت و فێڵی ئێوەی ژنان دەکات ﴿إن كيدكن عظيم﴾ چونکە نەخشەو پیلان و فرت و فێڵی ئێوە گەلێك گەورەیە ﴿[٢٩] يوسف أعرض عن هذا﴾ ئەوجا ڕوویکردە یوسف و وتی: یوسف! ساتۆش لەمە واز بێنەو، لێی بێدەنگبە، با ئابڕوومان نەچێت ﴿واستغفري لذنبك﴾ ئافرەت! تۆیش داوای لێبوردن بۆ هەڵەو گوناهەکەت بکە، چونکە لەلایەکەوە پێچاتە ئەولاوە غەریبە، لەلایەکی تریشەوە بوختانت بۆکرد! ﴿إنك كنت من الخاطئين﴾ بەڕاستیی تۆ لەخەتاکارانی. بەڵێ.. ئابەم شێوەیە ئەو تاوانە گەورەیە لەلای ئەوماڵ و خێزانە ڕووخاوە زۆر بەبچووکی و ئاسانی کپکرایەوە. (ئیبن جەریر) لە (ئیبن عەباس)ـەوە دەڵێ: هەر بەبچووکی و ناوەخت چوار منداڵ هاتوونە قسەو گوتار: کوڕەکەی (ماشیتە)ی کچی فیرعەون، شایەتەکەی یوسف، هاوڕێکەی (جورەیج)، عیسای کوری مەریەم.

### ژنانی شار دەنگ و باسەکە دەبیسن:

بەڵێ ئەو کارەساتە لەدەرەوەی کۆشکی پاشاوە دەنگی دایەوە، بۆیە ﴿[٣٠] وقال نسوة في المدينة﴾ کۆمەڵێك لەژنە ناودارەکانی میسر قاویان داخست و وتیان: ﴿امراة العزيز تراود فتاها﴾ سەیرە! ژنەکەی (عەزیز) خەریکی دڵداریی و ڕامکردنی غوڵامەکەی خۆیەتیی و حەزی لێ دەکا! ﴿قد شغفها حبا﴾ بە شێوەیەك ئەوین و خۆشەویستی چووەتە ناوپەردەی دڵیەوەو ئۆقرەی لێبڕیوە ﴿إنا لنراها في ضلال مبين﴾ بەڕاستیی ئێمە لەسەرگەردانیەکی ئاشکرادا دەیبینین, چونکە نەدەبوو ئەو لەگەڵ خزمەتکارێکی خۆیدا کاری وابکات ﴿[٣١] فلما سمعت بمكرهن﴾ ئینجا کەژنەکەی عەزیز تیروتانەی ئەو ژنانەی بیست ﴿أرسلت إليهن﴾ بۆ گێڕانەوەی ئابڕووی خۆیی و، دەربازکردنی خۆیی و، بۆئەوە بەوانیشی بسەلمێنی کە لەوکارەدا ناهەقی نەبووە، ئەر ئەوانیش وەکو ئەو بیبینن، خراپتر دووچاری ئەوینی دەبن ، بۆیە ناردی بەدوایاندا ﴿واعتدت لهن متكأ﴾ و بۆ هەریەکەشیان ڕایەخی جوان و پاڵە

پشتیی و خواردەمەنی بۆ ئامادەکردن، وەکو باوی دەسەڵاتدارانی سەردەم ﴿وآتت كل واحدة منهن سكينا﴾ وە بۆ هەر یەکەیشیان چەقۆیەکی میوە خواردنی پێ سپاردن، دیارە شارستانیەتی (میسر) لەو سەردەمەدا لەپلەو پایەیەکی پێشکەوتوودا بووە ﴿وقالت اخرج عليهن﴾ ئەوجا لەوکاتەدا ئەوان سەرگەرمی خواردن بوون، ئەمیش ناردی یوسف هات و پێیگوت: ئادەی هەر ئێستا وەرە دەرەوە بۆ ناویان ﴿فلما رأينه أكبرنه﴾ ئینجا هەر کەیوسف هات و دیتیان، بەشتێکی گەورەو بێ وێنەو دڵڕفێنیان دانا، ئیتر حەپەسان و مەست و حەیران بوون ﴿وقطعن أيديهن﴾ و چاویان تێ بڕیی و ئاگایان لەخۆیان نەماو، دەستی خۆیانیان بڕی ﴿وقلن حاش لله﴾ و وتیان: پاك و خاوێنی هەر بۆ خوا، (بەڵێ ئەو رستەی (حاش لله)یە لەکاتی شتی سەرسوڕهێنەردا لەناو عەرەباندا دەوترێ). ﴿ما هذا بشرا﴾ بێگومان ئەم لاوە ئادەمیی نییە، کە ئەوەندە جوانە ﴿إن هذا إلا ملك كريم﴾ بێ و نەبێ، ئەمە هەرفریشتەیەکی قەشەنگ و خاوەن ڕێزە. پێشەوا (موسلیم/خوا لێی ڕازیی بێت- لەباسی شەو ڕەوییەکەی پەیامبەردا ﷺ ئەم فەرموودەیە هێناوەو دەڵێت: ((أن رسول الله ﷺ مر بيوسف عليه السلام في السماء الثالثة، قال: فإذا هو قد أعطى شطر الحسن)) واتە: پێغەمبەر ﷺ لە ئاسمانی سێیەمدا بەیوسف گەیی، دیتی نیوەی جوانیی گشتی دونیای پێبەخشراوە! ﴿[32] قالت فذالكن الذى لمتنني فيه﴾ کە ژنەکە دیتی وا ئەوانیش هەموو گیرۆدەی دەردی ئەوین بوون، ئیتر خۆی بە سەرکەوتوو داناو وتی: ئەمە ئەو جوانەیە کەئێوە لۆمەو سەرزەنشتی منتان ئەکرد لەسەر ئەوینی، خۆبینیتان ؟! ﴿ولقد راودته عن نفسه فاستعصم﴾ ئەمەیش ڕاستیی ڕووداوەکەیە: من هەوڵێکی زۆرمدا بۆ ڕامکردنی و لەخشتەبردنی بۆ ئەنجامدانی ئەوکارە، بەڵام ئەو هەر خۆی گرت و ڕووی نیشان نەداو خۆی پاراست ﴿ولئن لم يفعل ما آمره﴾ ئێستاش ئەگەر بەقسەم نەکات بۆ ئەوکارە کە فەرمانی پێدەکەم ﴿ليسجنن وليكونا من الصاغرين﴾ دەبێ بخرێتە ناو بەندیخانەوەو، زەلیل و ریسوایش بکرێت " دیارە ئەمانیش وەکو شاژن گیرۆدەی ئەو ئەوینە ببوون، بۆیە بێپەردە مەبەستەکەی خۆی درکان لایان ! ﴿[33] قال: رب السجن أحب إلى مما يدعونني إليه﴾ جا لەوەڵامی ئەو هەڕەشەو گوڕەشەیەدا یوسف وتی: ئەی پەروەردگاری من! بەندیخانەکەم زۆر لاخۆشترە لەوکارە دزێوە وا ئەو ژنانە منی بۆ بانگ دەکەن و داوای لەمن دەکەن ﴿وإلا تصرف عنى كيدهن﴾ خۆ ئەگەر تۆ فێڵ و حیلەی ئەوانەم لێ لانەدەیت بەمیهرەبانی خۆت ﴿أصب إليهن﴾ لەوانەیە دڵم مەیل و ئارەزوویان بکات ﴿وأكن من الجاهلين﴾ و بچمە ڕیزی نەزان و نەفامەکانەوە، بێگومان ئەمە ئەوپەڕی جوامێریی و شەهامەتە کە: لاوێکی شۆخ و شەنگی وەکو یوسف، خانمێکی وەکو شاژن لەو جێگا رازاوەو ئامادەیەدا، جگە لەخوا ڕێگرێك نەبێت، کەچی خۆی نەدا بەدەستەوەو، لەهەڕەشەی زیندان و بەندیخانەش نەترسێ

سُورَةُ يُوسُفَ — الجزء الثاني عشر

فَلَمَّا سَمِعَتْ بِمَكْرِهِنَّ أَرْسَلَتْ إِلَيْهِنَّ وَأَعْتَدَتْ لَهُنَّ مُتَّكَـًٔا وَءَاتَتْ
كُلَّ وَٰحِدَةٍ مِّنْهُنَّ سِكِّينًا وَقَالَتِ ٱخْرُجْ عَلَيْهِنَّ فَلَمَّا رَأَيْنَهُۥٓ أَكْبَرْنَهُۥ
وَقَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ وَقُلْنَ حَٰشَ لِلَّهِ مَا هَٰذَا بَشَرًا إِنْ هَٰذَآ إِلَّا مَلَكٌ
كَرِيمٌ ﴿٣١﴾ قَالَتْ فَذَٰلِكُنَّ ٱلَّذِى لُمْتُنَّنِى فِيهِ وَلَقَدْ رَٰوَدتُّهُۥ عَن
نَّفْسِهِۦ فَٱسْتَعْصَمَ وَلَئِن لَّمْ يَفْعَلْ مَآ ءَامُرُهُۥ لَيُسْجَنَنَّ وَلَيَكُونًا
مِّنَ ٱلصَّٰغِرِينَ ﴿٣٢﴾ قَالَ رَبِّ ٱلسِّجْنُ أَحَبُّ إِلَىَّ مِمَّا يَدْعُونَنِىٓ
إِلَيْهِ وَإِلَّا تَصْرِفْ عَنِّى كَيْدَهُنَّ أَصْبُ إِلَيْهِنَّ وَأَكُن مِّنَ ٱلْجَٰهِلِينَ
﴿٣٣﴾ فَٱسْتَجَابَ لَهُۥ رَبُّهُۥ فَصَرَفَ عَنْهُ كَيْدَهُنَّ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ
ٱلْعَلِيمُ ﴿٣٤﴾ ثُمَّ بَدَا لَهُم مِّنۢ بَعْدِ مَا رَأَوُا۟ ٱلْـَٔايَٰتِ لَيَسْجُنُنَّهُۥ
حَتَّىٰ حِينٍ ﴿٣٥﴾ وَدَخَلَ مَعَهُ ٱلسِّجْنَ فَتَيَانِ قَالَ أَحَدُهُمَآ
إِنِّىٓ أَرَىٰنِىٓ أَعْصِرُ خَمْرًا وَقَالَ ٱلْءَاخَرُ إِنِّىٓ أَرَىٰنِىٓ أَحْمِلُ فَوْقَ
رَأْسِى خُبْزًا تَأْكُلُ ٱلطَّيْرُ مِنْهُ نَبِّئْنَا بِتَأْوِيلِهِۦٓ إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ
ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٣٦﴾ قَالَ لَا يَأْتِيكُمَا طَعَامٌ تُرْزَقَانِهِۦٓ إِلَّا نَبَّأْتُكُمَا
بِتَأْوِيلِهِۦ قَبْلَ أَن يَأْتِيَكُمَا ذَٰلِكُمَا مِمَّا عَلَّمَنِى رَبِّىٓ إِنِّى تَرَكْتُ
مِلَّةَ قَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَهُم بِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ كَٰفِرُونَ ﴿٣٧﴾

٢٣٩

﴿[٣٤] فاستجاب له ربه﴾ پەروەردگاری وەڵامی دایەوەو نزاکەی گیرا کرد ﴿فصرف عنه کیدهن﴾ و حیلەو فێڵکەیانی لادا لێی ﴿إنه هو السمیع العلیم﴾ چونکە بەڕاستیی هەر خۆیەتی بیسەرو زانای ، هاناو هاواری خەڵکانی لێقەوماو دەبیسێ و وەڵامیان دەداتەوە. لەفەرموودەیەکی (متفق علیه)یدا هاتووە دەفەرموێ: ((سبعة یظلهم الله فی ظله یوم لا ظل إلا ظله: إمام عادل، وشاب نشأ فی عبادة الله، ورجل قلبه معلق بالمسجد، إذا خرج منه حتی یعود إلیه، ورجلان تحابا فی الله اجتمعا علیه وافترقا علیه، ورجل تصدق فأخفاها حتی لا تعلم شماله ما أنفقت یمینه، ورجل ذکر الله خالیا ففاضت عیناه، ورجل دعته امرأة ذات جمال ومنصب فقال: إنی أخاف الله)).واتە: لەرۆژی هەستانەوەدا خوا حەوت تاقم لەبن سێبەری خۆیدا رادەگرێ و، ناهێڵێ تووشی ئەو نارەحەتییە بن، یەکێکیان لاوێکە ژنێکی شۆخ وشەنگ و پایەدار خۆی بۆ ئامادە بکاو، ئەم لەبەرخوا – وەکو یوسف–خۆ پارێزێ و تەسلیم نەبێت.

**بڕیار درا یووسف زیندان بکرێ:**

﴿[٣٥] ثم بدالهم من بعد مارأوا الآیات﴾ پاشان دوای بینینی ئەو هەموو بەڵگەو نیشانەیە لەسەر پاکی یوسف ، بۆ خۆیان وایان بەچاکزانی بۆ بزرکردنی دەنگۆکە ﴿لیسجننه حتی حین﴾ تا ماوەیەك بیخەنە بەندیخانەوە، بەڵکو وردە وردە دەنگ و باسەکە نەمێنێ و، لەبیر بچێتەوە، دیارە ئەو بنەماڵە دنیا پەرست و بەزیوانە ، ئەمە خوویانە کە لەباتی ئەوە سزای تاوانبارەکە بدەن و تۆڵە بدرێت، تاوانبار ئازادەو، بێتاوانێکی وەکو (یوسف) زیندان ئەکرێ !!.

**دوو غوڵام لەگەڵ یوسف زیندان دەکرێن:**

﴿[٣٦] ودخل معه السجن فتیان﴾ هاوکات دوولاویش، بەتۆمەتێك – لەگەڵیا زیندان کران، وە هەردووکیشیان لەدەست و پێی (پاشا) بوون ﴿قال أحدهما: إنی أعصر خمرا﴾ جا پاش ئەوە چوونە گرتووخانەکەوە، هەریەکەیان خەوێك دەبینێ و،دەیگێڕێتەوە بۆ یوسف، هەتا ماناکەی بۆلێك بداتەوە، بۆیە یەکێکیان گوتی: لەخەومدا دیتم بۆ شەراب ترێ ئەگوشم و، دەیدەمە پاشا ﴿وقال الآخر: إنی أرانی أحمل فوق رأسی خبزا تأکل الطیر منه﴾ و ئەوی دیکەیشیان وتی: منیش لەخەودا دیتم نان لەسەر سەرمەو باڵندە لێیدەخوات ﴿نبئنا بتأویله إنا نراك من المحسنین﴾ بەڵکە مانای ئەم خەونەمان بۆ لێکبدەیتەوە، چونکە بەڕاستیی ئێمە وادەزانین تۆ مەردێکی ڕەوشت بەرزو چاکە خوازیت.

**یوسف بانگی دوو زیندانیەکەدەکات بۆ موسڵمان بوون:**

﴿[٣٧] قال: لا یأتیکما طعام ترزقانه﴾ یوسف وتی: سبەینێ هەر ژەمە نانێکتان بۆبێت ﴿إلا نبأتکما بتأویله قبل أن یأتیکما﴾ پێش ئەوە بگاتە دەستتان من دەزانم چییەو، پێشتان دەڵێم، واتە: مانای خەونەکانیشتان هەروا بەئاسانی بۆلێك دەدەمەوە ﴿ذلك مما علمنی ربی﴾ دیارە ئەوە لە بەهرەی پەروەردگارمەو ئەو فێری کردووم, جا یوسف دەیەوێ لەرێی داخوازیەکانیانەوە دەرگایان لێبکاتەوەو، بچێتە ناو بانگەوازەکەیەوەو، بۆلای خوای تاك و تەنیایان بانگ بکات، بۆیە ئەیەوێ متمانەی تەواویان بداتێ کە: هەرکەسێك پشت لەشیرك بکاو، واز لەبت و بتپەرستی بێنێ، خوای گەورەش دەرگای خێری بۆدەکاتەوەو ، زۆر شتیشی فێر دەکات، بۆیە گوتی:﴿إنی ترکت ملة قوم لا یؤمنون بالله وهم بالآخرة هم کافرون﴾ چاك بزانن کە من ئایینی ئەو کەسانەم واز لێهێناوە کە نە بڕوایان بەخوا هەیەو نە بەرۆژی دوایی ﴿[٣٨] واتبعت ملة آبائی إبراهیم وإسحاق ویعقوب﴾ وە بۆخۆم کەوتوومەتە شوێنی ئایینی باوو باپیرانم: (ئیبراهیم) و (ئیسحاق) و (یەعقووب) ، هەرکەسێکی دیکەش ئاوا بکات، هەر ئاوا سەرکەوتوو

دەبێ و خوا دەرگای زانستیی بۆ واز دەکات ﴿ما كان لنا أن نشرك بالله من شئ﴾ هەرگیز نابێ بۆ ئێمەی (خانەوادەی پێغەمبەران و شوێنکەوتوانیان) هیچ شتێك بکەینە هاوبەش و هاوەڵی خوا ﴿ذلك من فضل الله علينا وعلى الناس﴾ ئەوەیش بەش و بارەی خوایە بەسەر ئێمەی (بنەماڵەی پێغەمبەران)ـەوە، کەپلەی پەیامبەرێتی پێبەخشین و، بەسەر خەڵکان و مەردمیشەوە کە: پێغەمبەرانی بۆناردن ﴿ولكن اكثر الناس لا يشكرون﴾ بەڵام زۆربەی خەڵکی سوپاسگوزاری ناکەن , وەکو لەجێگایەکی تردا دەفەرموێ (..بدلوا نعمة الله كفرا وأحلوا قومهم دار البوار) ١٤ /٢٨). جایوسف وردە وردە دەیەوێ بانگەوازەکەی رابگەیەنێ. بۆیە دەڵێت: ﴿[٣٩] يا صاحبى السجن: أرباب متفرقون خير﴾ ئەی هەر دوو هاوڕێی بەندیخانەکەم! ئاخۆ چەند خوایەکی جیا جیا بپەرسترێن باشترە ﴿ام الله الواحد القهار﴾ یان هەر یەك خوای تاك و تەنیاو زاڵ و بەدەسەلات بەسەر هەموو شتێکدا؟ ﴿[٤٠] ما تعبدون من دونه إلا أسماء﴾ ئەوەش بزانن ئەوانەی ئێوە "بەدەر لەخوا" دەیانپەرستن چەند (ناو)ێکی بێ ناوەڕۆکن ﴿سميتموها انتم وآباؤكم﴾ و ئێوەو باوو باپیرانتان بەئارەزووی خۆتان ناوتانناون و کردووتانن بە خوا! ﴿ما انزل الله بها من سلطان﴾ خوا هیچ بەڵگەیەکی بۆراستیی پەرستنی ئەوانە نەناردووە. جا یوسف ئەیەوێ رۆشنتر بۆیان باس بکات، بۆیە دەڵێت: ﴿إن الحكم إلا لله﴾ گشت حوکم و بڕیارێك تەنهاو تەنها هی خوایە, دەبێ تەنها ئەو حاکم و بڕیار بەدەست بێت ﴿أمر ألا تعبدوا إلا إياه﴾ فەرمانیداوە کە: ئێوە دەبێ تەنها ئەو بپەرستن و گوێڕایەڵیی هەر لەوبکەن، نەك لەسەرۆك عەشیرەت، نەك لەگەل و نەتەوە، نەك لەولات و نیشتمان، نەك لە حیزب و گرووپ و خێڵ..هتد ﴿ذلك الدين القيم﴾ هەر ئەو ئایین و دینە راست و رەواو پایەدارە، کە بانگتانم کرد بۆی، دەسا وریاو بەئاگابن وشوێنی بتان مەکەون ﴿ولكن اكثر الناس لا يعلمون﴾ بەڵام زۆربەی ئەو مەردمە نازانن ئایینی یەکخواپەرستی راست و رێکە، خوای باڵادەست لەجێگایەکی تردا دەفەرموێ: (وما اكثر الناس ولو حرصت بمؤمنين) یوسف/١,٣) جائێستا دەست دەکات بەماناو لێکدانەوەی خەونەکانیان، بۆیە دەفەرموێ: ﴿[٤١] يا صاحبى السجن﴾ ئەی هەردوو هاوڕێیانی بەندیخانەم! ﴿أما احدكما فيسقى ربه خمرا﴾ بەڵام ئەو یەکەتان کە لەخەویدا ترێی دەکردە شەراب، ئازاد ئەبێ و، شەراب دەرخواردی پاشای دەدات ، واتە: پزگاری ئەبێت و دەچێتەوە سەر کاری خۆی ﴿وأما الآخر فيصلب﴾ ئەوی دیکەش لەسێدارە ئەدرێ و، هەڵدەواسرێ و بەدارەکەوە ئەهێڵرێتەوە ﴿فتأكل الطير من راسه﴾ ئەوسا پەلەوەر لەسەری دەخۆن. ریوایەتێك دەڵێت کەبەو جۆرە مانای خەونەکەی بۆکردن، بەدڵیان نەبووو گوتیان : نەخێر هیچ خەونێکمان نەدیتووە، (یوسف)یش گوتی:﴿قضى الأمر الذى فيه تستفتيان﴾ ئەوی پرسیارتان لێکرد، لای خوا بڕاوەتەوەو ناگۆڕدرێ، چونکە خەون بۆ یەکەمجار چۆن مانا

الجزء الثاني عشر — سورة يوسف

وَٱتَّبَعۡتُ مِلَّةَ ءَابَآءِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَۚ مَا كَانَ
لَنَآ أَن نُّشۡرِكَ بِٱللَّهِ مِن شَيۡءٖۚ ذَٰلِكَ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ عَلَيۡنَا وَعَلَى
ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشۡكُرُونَ ﴿٣٨﴾ يَٰصَٰحِبَيِ
ٱلسِّجۡنِ ءَأَرۡبَابٞ مُّتَفَرِّقُونَ خَيۡرٌ أَمِ ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ
﴿٣٩﴾ مَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ أَسۡمَآءٗ سَمَّيۡتُمُوهَآ أَنتُمۡ
وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلۡطَٰنٍۚ إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِ
أَمَرَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ
ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٤٠﴾ يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ أَمَّآ أَحَدُكُمَا
فَيَسۡقِي رَبَّهُۥ خَمۡرٗاۖ وَأَمَّا ٱلۡأٓخَرُ فَيُصۡلَبُ فَتَأۡكُلُ ٱلطَّيۡرُ
مِن رَّأۡسِهِۦۚ قُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ ٱلَّذِي فِيهِ تَسۡتَفۡتِيَانِ ﴿٤١﴾ وَقَالَ لِلَّذِي
ظَنَّ أَنَّهُۥ نَاجٖ مِّنۡهُمَا ٱذۡكُرۡنِي عِندَ رَبِّكَ فَأَنسَىٰهُ
ٱلشَّيۡطَٰنُ ذِكۡرَ رَبِّهِۦ فَلَبِثَ فِي ٱلسِّجۡنِ بِضۡعَ سِنِينَ
﴿٤٢﴾ وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ إِنِّيٓ أَرَىٰ سَبۡعَ بَقَرَٰتٖ سِمَانٖ يَأۡكُلُهُنَّ
سَبۡعٌ عِجَافٞ وَسَبۡعَ سُنۢبُلَٰتٍ خُضۡرٖ وَأُخَرَ يَابِسَٰتٖۖ
يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَأُ أَفۡتُونِي فِي رُءۡيَٰيَ إِن كُنتُمۡ لِلرُّءۡيَا تَعۡبُرُونَ ﴿٤٣﴾

٢٤٠ قالوا أضغث

لێدرایەوە، لەئایندەشدا هەروا دەبێ و، گۆڕین و پەشیمان بوونەوە لەو بڕیارە (ئەزەل)ییە تۆزقاڵەیەك ناگۆڕێ، ئەمەیکە پێغەمبەریش دەفەرموێ: ((الرؤیا علی رجْل طائر مالم تعبر ، فإذا عبرت وقعت)) مەسنەدی پێشەوا(ئەحمەد/ ٤ / ١٠).

**یوسف بەیەك لەو دوانە دەڵێ لای ئاغات باسم بكە :**

﴿[٤٢] وقال للذی ظن انه ناج منهما﴾ ئەوجا كە یوسف زانی شەرابگێڕەكە لەبەندیخانە قوتار دەبێت پێیگوت: ﴿اذكرنی عند ربك﴾ كە دەچیتەوە لای پاشاو گەورەكەت (عەزیزی میسر) باسی ئەم داستان و بەسەر هاتەی منی لابكە" دەیەوێ ڕوو بەڕووی خۆی ڕاستییەكەی تێبگەیەنێ ، سەبارەت بەو بوختانە گەورەیە بۆیكرا ﴿فأنساه الشیطان ذكر ربه﴾ ئینجا كاتێ لە زیندان دەرچووو گەڕایەوە كۆشكی پاشا، شەیتان لەبیری بردەوە لای گەورەو پاشاكەی باسی بكا!. هەندێ لە زاناكان راناوی (فأنساه الشیطان..) دەبەنەوە بۆ یوسف، واتە: شەیتان یادی خوای لەبیر بردەوە، بۆیە پەنای بردە بەر خزمەتگوزارو شتی وا، ئەوجا خوایش لەتۆڵەی ئەوەدا چەندساڵێ لێی نەپرسی، بۆیە دەفەرموێ: ﴿فلبث فی السجن بضع سنین﴾ ئیتر یوسف بەویستی خوا تاچەند ساڵێك لە گرتووخانەكەدا مایەوە، بۆ ئەوەی دەستی لەهەموو شتێك بڕێ و، هاناو پەنا هەر بۆ خوا بەرێت . بەڵێ..بەپێی مانای وشەی (بضع/ كەلە سێ ساڵەوە بۆنۆ دەكات) لەوە دەچێت حەوت ساڵێك لە گرتووخانەكەدا مابێتەوە، لەبەر هەر حیكمەتێك خوای لەكارزان خۆی دەیزانێ. (ئیبن عەباس) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر یوسف نەیگوتبا بەڵكو ,لای پاشاكەت وەبیرم بێنیت , ئەوەندە لەو گرتووخانەدا نەدەمایەوە! تەفسیری تەبەریی.

**شای میسر خەونێك دەبینێ :**

﴿[٤٣] وقال الملك إنی أری سبع بقرات سمان﴾ ئینجا خوای كارجوان دەیەوێ بەسەر بەرزیی و سەروەریی یوسف لەبەندیخانە ڕزگار بكاو بێتەدەرێ، ڕۆژێك پاشا خەوێك دەبینێت و دەبێتە مەراقی شەوو ڕۆژی و، لەترسی شوومی خەوەكەیدا تەواوی جادووگەرو ئەستێرە ناسەكانی وڵاتەكەی كۆ دەكاتەوە بۆماناكردنی خەوەكەی، كەچی هیچیان سەری لێدەر ناكەن ! خەوەكەیشی بەم شێوە بووو گوتی: لەخەومدا حەوت مانگای گەورەی قەڵەوم دیت ﴿یاكلهن سبع عجاف﴾ حەوت مانگای لەڕو لاواز دەیانخواردن! ﴿وسبع سنبلات خضر واخر یابسات﴾ حەوت گوڵە گەنمی سەوزو تەڕو، حەوت گوڵە گەنمی وشكهەڵاتوو زەردم دیت كە: لەحەوت گوڵە سەوزەكە ئاڵا بوون وفەوتانیانن ﴿یا ایها الملأ افتونی فی رؤیای إن كنتم للرؤیا تعبرون﴾ ئەی دەستەی پیاو ماقوڵان و دونیا دیدان! مانای ئەو خەوەم بۆ لێكبدەنەوە، ئەگەر لەمانای خەو لێكدانەوە دەزانن ﴿[٤٤] قالوا أضغاث احلام﴾ ئەوانیش وتیان: ئەو جۆرە خەوانە، هەرخەونە درۆزنەو تێكەولێكەن و هەقیقەتیان نییە، جا یا هەر دەركیان نەكرد، یا لەبەر پاشا نەیان وێرا بەڕاستیی لێكی بدەنەوە ﴿وما نحن بتأویل الأحلام بعالمین﴾ خۆ ئێمەش لەمانای ئەم جۆرە خەوانە نازانین و سەر دەرناكەین ﴿[٤٥] وقال الذی نجا منهما وادكر بعد أمة﴾ ئینجا ئەو یەكە لەدوو زیندانییەكە ڕزگاری ببوو"و دوای ماوەیەكی زۆر یوسفی بیر كەوتەوەو وتی: ﴿أنا انبئكم بتأویله﴾ من لەمانای ئەوخەونە ئاگادارتان دەكەم" لای كەسێكی زاناو شارەزا" ﴿فأرسلون﴾ دەسا بمنێرن، با بچم بۆ لای ئەولاوە كە ئێستا لەزینداندایەو، پێكەوە بووین ﴿[٤٦] یوسف أیها الصدیق﴾ جا (ساقیی) بەزوویی چوو و گەیشتە لای یووسف و گوتی: یوسف! ئەی پیاوی ڕاست بێژ ! ﴿افتنا فی سبع بقرات سمان﴾ رای خۆت بدە سەبارەت بە حەوت مانگای قەڵەوو زلە ﴿یأكلهن سبع عجاف﴾ كە حەوت مانگای لەڕوو لاواز دەیانخۆن ﴿وسبع سنبلات خضر﴾ و حەوت گوڵە گەنمی سەوزو تەڕ ﴿واخر یابسات﴾ و حەوتی تری

وشکەڵاتوویش ﴿لعلی ارجع إلى الناس﴾ بەشکوم بچمەوە لای پاشاو خەڵکەکە" بۆیانی بگێڕمەوە" ﴿لعلهم یعلمون﴾ بەشکو ئەوانیش لەشان و شەوکەتی تۆ تێبگەن و بتناسن.

رێنماییەکانی ئایەتی (٤٣-٤٦):

١- دەگونجێ خەڵکی کافرو لەسنوور دەرچوویش، خەونی چاك و راست ببینن, خەو دووبەشە: بەشێکی تێکەو لێکەیەو، لەلایەن شەیتانەوەیە، ئەوی دیکەیشیی هەق و راستەو، لەلایەن خوای بەخشەرەوەیە.

٢- شت لە بیرکردن خووو رەوشتی هەموو ئادەمییەکە.

٣- باسکردنی صیفەت و پەسنی هەرمرۆڤێك ، بێ زیادو کەم, شتێکی دروست ورەوایە.

﴿[٤٧] قال تزرعون سبع سنین دابا﴾ (یوسف)یش بێ هیچ گلەیی و گازندەیەك لە کابرای شەرابگێڕ، بێ ئەوە بڵێ باشە! ئەوکات تۆ لەبەندیخانە ئازاد بوویت و گەڕایتەوە بۆلای پاشا من چیم پێگوتیت؟ وەڵامی ساقیی دایەوەو وتی: ئێوە حەوت ساڵ لەسەریەك کشتوکاڵ" بەرێك و پێکی دەکەن و دانەوێڵە دەچێنن ﴿فما حصدتم فذروه فی سنبله إلا قلیلا مما تأكلون﴾ ئەوی دووریتانەوە- ئەوە نەبێ لێی دەخۆن- هەر لەگوڵەکەی خۆیدا بیهێڵنەوەو لەعەنباردا داینێن ، چونکە ئاوا لەسوون و جانەوەران دەپارێزرێت, واتە: هەر بەگوڵەکەیەوە بیکەنە عەمبارو، کەمکەم لێیبخۆن و دەست پێوە بگرن ﴿[٤٨] ثم یأتی من بعد ذلك سبع شداد﴾ جا لەپاش ئەو حەوت ساڵە" خۆش و پڕپیتە" حەوت ساڵی گرانیی و، قاتی و قڕیی و، وشکەساڵی پێش دێت ﴿یاکلن ما قدمتم لهن﴾ هەر رزق و رۆزییەکتان ئەو حەوت ساڵە دانابێ هەمووی دەخۆن ﴿إلا قلیلا مما تحصنون﴾ کەمێکی نەبێت کە بۆ تۆوی هەڵدەگرن و، ئازووخەی دەکەن ﴿[٤٩] ثم یأتی من بعد ذلك عام﴾ لە پاش ئەوحەوت ساڵە گرانییە، ئەمجار ساڵێکی خۆش پێشدێت ﴿فیه یغاث الناس﴾ بۆ هەموو خەڵکی بارانێکی زۆر دەبارێ و، ڕزق و رۆزی پەیدا دەبێتەوە ﴿وفیه یعصرون﴾ هەر لەوساڵەدا میوەجات و ترێ زۆردەبێ و دەیگوشن" و شەربەت و پێخۆری لێ پەیدا دەکەن بۆ خۆیان ئەی هاوڕێکەم! ئەمەیە مانای خەوەکەی پاشا، مانگا لەڕو لاوازەکان و، گوڵە وشك هەڵاتووەکان، حەوت ساڵە گرانییەکەیە، دەساتۆش بەرێك وپێکی بۆ پاشای بگێڕەوە.



قَالُوٓاْ أَضۡغَٰثُ أَحۡلَٰمٖۖ وَمَا نَحۡنُ بِتَأۡوِيلِ ٱلۡأَحۡلَٰمِ بِعَٰلِمِينَ ٤٤
وَقَالَ ٱلَّذِي نَجَا مِنۡهُمَا وَٱدَّكَرَ بَعۡدَ أُمَّةٍ أَنَا۠ أُنَبِّئُكُم بِتَأۡوِيلِهِۦ
فَأَرۡسِلُونِ ٤٥ يُوسُفُ أَيُّهَا ٱلصِّدِّيقُ أَفۡتِنَا فِي سَبۡعِ بَقَرَٰتٖ
سِمَانٖ يَأۡكُلُهُنَّ سَبۡعٌ عِجَافٞ وَسَبۡعِ سُنۢبُلَٰتٍ خُضۡرٖ
وَأُخَرَ يَابِسَٰتٖ لَّعَلِّيٓ أَرۡجِعُ إِلَى ٱلنَّاسِ لَعَلَّهُمۡ يَعۡلَمُونَ ٤٦ قَالَ
تَزۡرَعُونَ سَبۡعَ سِنِينَ دَأَبٗا فَمَا حَصَدتُّمۡ فَذَرُوهُ فِي سُنۢبُلِهِۦٓ إِلَّا
قَلِيلٗا مِّمَّا تَأۡكُلُونَ ٤٧ ثُمَّ يَأۡتِي مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ سَبۡعٞ شِدَادٞ يَأۡكُلۡنَ
مَا قَدَّمۡتُمۡ لَهُنَّ إِلَّا قَلِيلٗا مِّمَّا تُحۡصِنُونَ ٤٨ ثُمَّ يَأۡتِي مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ
عَامٞ فِيهِ يُغَاثُ ٱلنَّاسُ وَفِيهِ يَعۡصِرُونَ ٤٩ وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ ٱئۡتُونِي
بِهِۦۖ فَلَمَّا جَآءَهُ ٱلرَّسُولُ قَالَ ٱرۡجِعۡ إِلَىٰ رَبِّكَ فَسۡـَٔلۡهُ مَا بَالُ
ٱلنِّسۡوَةِ ٱلَّٰتِي قَطَّعۡنَ أَيۡدِيَهُنَّۚ إِنَّ رَبِّي بِكَيۡدِهِنَّ عَلِيمٞ ٥٠ قَالَ
مَا خَطۡبُكُنَّ إِذۡ رَٰوَدتُّنَّ يُوسُفَ عَن نَّفۡسِهِۦۚ قُلۡنَ حَٰشَ لِلَّهِ
مَا عَلِمۡنَا عَلَيۡهِ مِن سُوٓءٖۚ قَالَتِ ٱمۡرَأَتُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡـَٰٔنَ حَصۡحَصَ
ٱلۡحَقُّ أَنَا۠ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفۡسِهِۦ وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ٥١ ذَٰلِكَ
لِيَعۡلَمَ أَنِّي لَمۡ أَخُنۡهُ بِٱلۡغَيۡبِ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي كَيۡدَ ٱلۡخَآئِنِينَ ٥٢



رێنماییەکانی ئایەتی (٤٧-٤٩):

١- وڵاتی (میسر) هەر لەسەرەتاوە جێگەی کشت و کاڵ بووەو، وڵاتێکی بەفەڕ بووە.

٢- هەڵگرتن و دەستپێوە گرتن و پاراستنی بەرو بووی تازەو نوێ بۆ رۆژی تەنگانە، بنەمایەکی ئابووریی زۆر گرنگە.

٣- زانایان دەڵێن: ئەم ئایەتە بەڵگەیەکی بەهێزە بۆ ڕەچاوکردنی بنەمای بەرژەوەندییە ڕەهاکان (المصالح المرسلة).

٤- کارامەیی و لێوەشاوەیی (یوسف-علیه السلام-) بۆ لێکدانەوەی مانای خەونەکان.

٥- پلەو فەزڵی یوسف بەسەر (میسر) یەکانەوە، چونکە زیاد لە پرسیارەکە بەدەمیانەوە چوو و لەو گرانییەیش فریایانکەوت.

**لێکۆڵینەوە لە ڕووداوەکەی نێوان یوسف و شاژن و ژنانی شار:**

﴿٥٠ وقال الملك ائتوني به﴾ نوێنەری پاشا گەڕایەوەو مانای خەوەکەی بۆ گێڕایەوەو چووە دڵیەوەو، بۆیشی دەرکەوت پیاوی ئاوا حەیفە لەزینداندا بێت، بۆیە وتی: ئادەی هەرئێستا بچن بیهێنن" با خۆم وتووێژی لەگەڵ بکەم" ﴿فلما جاءه الرسول﴾ جا کە ڕاسپاردەکە هاتە لای یوسف و قسەو باسەکەی پاشای بۆگێڕایەوەو، بڕیاری ئازاد بوونەکەشی پێگوت، یوسف بیریکردەوە باشە! چ سەر بەرزییەکی تێدایە"پاش حەوت ساڵ بەندیخانە، ئێستا بەهەمان تۆمەتەوە بچێتە دەرێ ؟﴿قال ارجع إلى ربك﴾ بۆیە بەراسپاردەکەی گوت: بگەڕێرەوە بۆلای پاشاو گەورەکەت ﴿فاسأله ما بال النسوة اللاتى قطعن ايديهن﴾ و لێبپرسە: هۆی چیبوو ئەو ژنانە دەستی خۆیانیان بڕی" ئەودەمە کەشاژن کۆی کردنەوە ؟ واتە: بپرسێ بزانێ من لەسەرچی گیراوم، وە ئایا من گوناهبارم یان ئەوانە.. ئەوسا لەزیندانەکە دێمەدەرێ و دەچمەلای ئەو" ﴿إن ربي بكيدهن عليم﴾ بێگومان پەروەردگارم بە فرت وفێڵی ئەوان چاك بەئاگایەو، زۆر باش دەزانێ کێ ڕاست ئەکا، بەڵام بۆ ئەوەی خەڵکی بزانێ کەمن دوورم لەو جۆرە بوختانانە . پێشەوا ئەحمەد- خوا لێی ڕازی بێت- ئەم فەرمودەیە ئەهێنێ: ((فقال رسول الله ﷺ: لو كنت أنا لأسرعت الإجابة وما ابتغيت العذر)) واتە: ئەگەر من لەجێی (یوسف)دا دەبووم بەزوویی وەڵامم ئەدایەوەو بەدوای پۆزش و بیانوودا نەدەگەڕام. دیارە مەبەستی باسی جوامێریی و لێهاتوویی و لێبراوەیی (یوسف)ـە ﷺ، چونکە ئەو ماوە زۆرە لە زینداندا مایەوە، کەچی تەنها تۆزقاڵەیەکیش دەستی لە خۆی بەرنەداو، تەسلیم نەبوو. ﴿٥١ قال ما خطبكن إذ راودتن يوسف عن نفسه﴾ نوینەرەکە گەڕایەوە لای پاشاو، هەرچی چووبوو بە بەینیاندا بۆی گێڕایەوەو، پاشایش ژنەکانی هەموو کۆکردەوەو وتی: حاڵتان چی بوو کاتێ ویستتان یوسف لە خشتەبەرن و، دەستەمۆی بکەن؟ ئایا ئەو هیچ تاوانێکی هەبوو؟ ﴿قلن حاش لله﴾ وتیان: خوا بەو ڕۆژە نەکا، ئێمە بوختانی بۆ بکەین ﴿ما علمنا عليه من سوء﴾ ئێمە قەت هیچ جۆرە هەڵەو خراپەیەکمان لە یوسف نەدیتووە ﴿قالت امراة العزيز﴾ لەولایشەوە ژنەکەی عەزیزی (پاشای میسر) هاتە پێشێ و بەئاشکرا وتی: ﴿الآن حصحص الحق﴾ وا ئێستا بێپەردە هەق و ڕاستیی ئاشکرا بوو ﴿انا راودته عن نفسه﴾ منبووم تەماحم لەیوسف کرد، ددان بە ڕاستییدا دەنێم ﴿وإنه لمن الصادقين﴾ چونکە یوسف لاوێکی بێ تاوانەو، لە ڕاستگۆیانە ﴿٥٢ ذلك ليعلم أني لم أخنه بالغيب﴾ ئینجا یوسف وتی: ئەمەش بۆیە من داوام لە عەزیزی میسر کرد لەو دەنگ و باسە بکۆڵێتەوە، تا چاك بزانێ ودڵنیابێت کە من" تەنانەتی لە پاش ملەیشەوە" خیانەتم لێنەکردووە، بەڵکو هەر ڕێزم بۆ خانەوادەی ئەو داناوە، دەشکرێ ئەمە قسەی شاژن بێت، هەتا قەناعەت بەشا بکات کە بۆیە ددانی بەهەڵەی خۆیدا نا کە دڵنیابێت هیچ کات گزیی وخەیانەتی لێنەکردووە ﴿وان الله لا يهدى كيد الخائنين﴾ وە چونکە خوا خیانەت و فیڵ و تەڵەکەی گزیکاران سەرناخاو بە ئەنجامی ناگەیەنێت.

رێنماییەکانی ئایەتی (٥٠-٥٢):

١- فەزیلەت و شەرەفی زانیاری و زانست، چونکە هەر بەهۆی زانیارییەوە بوو کە (یوسف) بەرز بوویەوەو گەییە لای پاشاو، بۆ دواییش جڵەوی کاروباری میسری گرتە دەست.

٢- گەورەیی (حیلم) و تاقەت و لەسەر خۆیی و پەلە نەکردن لە ئیش و کاردا.

٣- فەزڵی ڕاست بێژیی و، قسەی هەق کردن، ئەگەرچی بەزیانی خۆشت تەواو ببێ.

٤- (زلێخا)یش بەهۆی ددان نان بەتاوانی خۆیدا بەو پلەوپایە بەرزە گەیی و، بۆ دواییش بوویە ژنی (یوسف)ی پێغەمبەر عليه السلام .

کۆتایی جزمی (١٢) دوازدە
ولله الحمد والمنة
*** *** ***



۞ وَمَآ أُبَرِّئُ نَفْسِيٓۚ إِنَّ ٱلنَّفْسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ إِلَّا مَا رَحِمَ
رَبِّيٓۚ إِنَّ رَبِّي غَفُورٌ رَّحِيمٌ ٥٣ وَقَالَ ٱلْمَلِكُ ٱئْتُونِي بِهِۦٓ أَسْتَخْلِصْهُ
لِنَفْسِيۖ فَلَمَّا كَلَّمَهُۥ قَالَ إِنَّكَ ٱلْيَوْمَ لَدَيْنَا مَكِينٌ أَمِينٌ ٥٤ قَالَ
ٱجْعَلْنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلْأَرْضِۖ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٌ ٥٥ وَكَذَٰلِكَ
مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي ٱلْأَرْضِ يَتَبَوَّأُ مِنْهَا حَيْثُ يَشَآءُۚ نُصِيبُ
بِرَحْمَتِنَا مَن نَّشَآءُۖ وَلَا نُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُحْسِنِينَ ٥٦ وَلَأَجْرُ
ٱلْـَٔاخِرَةِ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ٥٧ وَجَآءَ إِخْوَةُ
يُوسُفَ فَدَخَلُواْ عَلَيْهِ فَعَرَفَهُمْ وَهُمْ لَهُۥ مُنكِرُونَ ٥٨ وَلَمَّا
جَهَّزَهُم بِجَهَازِهِمْ قَالَ ٱئْتُونِي بِأَخٍ لَّكُم مِّنْ أَبِيكُمْۚ أَلَا تَرَوْنَ
أَنِّيٓ أُوفِي ٱلْكَيْلَ وَأَنَا۠ خَيْرُ ٱلْمُنزِلِينَ ٥٩ فَإِن لَّمْ تَأْتُونِي بِهِۦ فَلَا
كَيْلَ لَكُمْ عِندِي وَلَا تَقْرَبُونِ ٦٠ قَالُواْ سَنُرَٰوِدُ عَنْهُ أَبَاهُ
وَإِنَّا لَفَٰعِلُونَ ٦١ وَقَالَ لِفِتْيَٰنِهِ ٱجْعَلُواْ بِضَٰعَتَهُمْ فِي رِحَالِهِمْ
لَعَلَّهُمْ يَعْرِفُونَهَآ إِذَا ٱنقَلَبُوٓاْ إِلَىٰٓ أَهْلِهِمْ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ
٦٢ فَلَمَّا رَجَعُوٓاْ إِلَىٰٓ أَبِيهِمْ قَالُواْ يَٰٓأَبَانَا مُنِعَ مِنَّا ٱلْكَيْلُ
فَأَرْسِلْ مَعَنَآ أَخَانَا نَكْتَلْ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ٦٣



﴿٥٣ وما أبرئ نفسي﴾ خۆ هەرگیزیش پاکانە بۆخۆم ناکەم ﴿إن النفس لأمارة بالسوء﴾ چونکە نەفس و دەروون هەمیشە فەرمان بەخراپە دەدا ﴿إلا مارحم ربي﴾ مەگەر کەسێ خوای پەروەردگارم خۆی ڕەحمی پێبکاو لەپیلان و فرت و فێڵی بیپارێزێ ﴿إن ربي غفور رحيم﴾ بەڕاستیی پەروەردگارم زۆر لێبوردەیە بۆ هەڵەو تاوانەکان، زۆریش دلۆڤان و میهرەبانە، بەرامبەر بە تەوبەکاران.

**ڕێز و پلەی یوسف لای پاشا:**

﴿٥٤ وقال الملك إئتوني به﴾ جا دوای دەرکەوتنی شەهامەت و پیاوەتیی و جوامێری یوسف، پاشا وتی: (یوسف)م بۆ بهێنن ﴿أستخلصه لنفسي﴾ با بیکەمە یارو هاوڕێی تایبەتی و، جێگەی پرس و ڕای خۆم، بۆ ڕاگرتنی دەوڵەتەکەم ﴿فلما كلمه﴾ جاکاتێ کە یوسف هاتە لایی و، دوانـدیی و وتووێـژی لەگەڵ کـردو، بەتـەواوی کەسێتی دەرکەوت ﴿قال إنك اليوم لدينا مكين أمين﴾ پاشا وتی: بەڕاستیی تۆ ئەمڕۆلای ئێمە پیاوێکی بەڕێزو قورس و پاك و جێگای باوەڕیت و، ئەو قسەو قسەڵۆکانەیش، هیچ لەکەسێتی تۆ کەم ناکاتەوە ﴿٥٥ قال اجعلني على خزائن الأرض﴾ یوسف وتی: جاکەوایە بمکە بە سەر کاری خەزێنەو واریداتی میسر هەتا بتوانم لەم گرانیی و قات و قڕیەدا خزمەتێ بەم خەڵکە هەژارە بکەم ﴿إني حفيظ عليم﴾ چونکە من بۆ ئەوکارە چاودێرێکی باش و، پارێزەرێکی زاناو بەئاگام. (تەبەریی) دەڵێت: ئەم داوای (یوسف)ـە وەك ئەوە نیە کە بڵێیت پاکانەی بۆ خۆیکردو، نەدەبوو بەوجۆرە خۆی هەڵکێشێ، چونکە یوسف دەیەوێ بەو قسانەی پیاوانی دەوڵەت لەخۆی تێبگەیەنێت کە: ئەو بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری ئابووریی و، دارایی پیاوێکی زۆر لێزانەو زانیاریی باشی هەیە، لەولایشەوە لەودەمەدایە وڵات و گەل زۆر پێویستی بە کەسێکی وا هەیەو، لەڕووی شەرعیشەوە نابێ لەکاتی وادا خۆی لێ لابدات،

لەلایەکی‌تریشەوە لەوجۆرە شوێنانەدا باشتر خزمەتی پێدەکرێ بۆ سەرنج ڕاکێشانی خەڵکی بۆ باوەڕ هێنان بەخوای گەورەو کارجوان.

**ڕێزو حورمەتی یوسف لەسەر زەویی:**

﴿٥٦ وكذلك مكنا ليوسف في الأرض﴾ ئاوا دوای ئەو تەنگانەو دەربەدەریە، ئێمە لەخاکی میسردا پلەو پایەو دەسەلاتمان بە یوسف دا ﴿يتبوء منها حيث يشاء﴾ لە هەر جێگایەك خۆی بیەوێ دادەنیشێ ﴿نصيب برحمتنا من نشاء﴾ کێمان بوێ دەیخەینە بەر بەزەیی و میهرەبانی خۆمان ﴿ولا نضيع أجر المحسنين﴾ و هەرگیزیش پاداشی چاکە خوازان نافەوتێنین و گوم ناکەین، لەکاتێکدا یوسف ئەوهەموو جوامێرییەی نواندو، ئەوگشت صەبرو ئارامەی بوو، ئێمەیش ئاوا بەرزمان کردەوەو، خەزێنەی میسرمان خستە ژێر دەستی ﴿٥٧ ولأجر الآخرة خير للذين آمنوا وكانوا يتقون﴾ ئەوە پاداشی دونیابوو، خۆ دیارە پاداشی دواڕۆژیش بۆئەوانەی کەبڕوایان هێناوەو، لەشیرك و کاری خراپ خۆ پارێزبوون باشترە، بەڵێ چونکە یوسف پلەوپایەی خۆیی و، خانەوادەکەی لەکاری بەدرەوشتی پاراست، خوایش ئاوا پلەی بەرزکردەوەو، لەقیامەتیشدا باشتری بۆ ئامادە کردووە، وەکو بە (سولەیمان) دەفەرموێ: (هذا عطاؤنا فامنن او امسك بغير حساب، وإن له عندنا لزلفى وحسن مئاب).

**لە ڕێنمایەکانی ئایەتی (٥٣-٥٧):**

١- فەزیلەتی نەفس شکاندن و تۆمەتبارکردنی بەناتەواویی و کەم و کووڕیی.

٢- دەرخستنی زانست و زانیاریی لەکاتی پێویستدا، وەك ئەڵێن: (المرء مخبوء تحت لسانه).

٣- بەخۆ هەڵدان و، خۆ کاندیدکردن بۆ هەرکارێ کە ئەگەر ئەوکەسە بەوجۆرە نەکا کەسێتی و دەستپاکی دەرنەکەوێ و، پێی نەزانن ڕەوایە.

٤- فەزیلەتی ئیخلاس لەکاروکردەوەو قسەو بیروباوەڕدا.

٥- گەورەیی و کاریگەری ئیمان و تەقوا لەهەست و نەستی مرۆڤدا.

**براکانی یووسف دێنە میسرو بە بارەوە دەگەڕێنەوە:**

﴿٥٨ وجاء إخوة يوسف﴾ گرانی و قات و قڕی لە ناوچەکانی (کەنعان)دا سەری هەڵدا، ئەوسا براکانی (یوسف)یش هاتن بۆ میسر بۆ زەخیرە کڕین ﴿فدخلوا عليه فعرفهم﴾ جا چوونە ژوور لای یوسف، ئەم ئەوانی ناسییەوە ﴿وهم له منكرون﴾ بەڵام ئەوان ئەمیان نەناسیەوە چونکە ماوەیەکی زۆر بوو نەیان دیتبوو، لەولایشەوە پێیان وانەبوو ئەومابێ و، ئاوا لە جێگەی پاشادا بێت ﴿٥٩ ولما جهزهم بجهازهم﴾ و کاتێ کە یوسف بارە خۆراکەکەی بۆ ڕێکخستن لەدوای ڕێزێکی زۆرو پرسیارو وەڵام لێیان ﴿قال ائتوني بأخ لكم من أبيكم﴾ وتی: برایەکی باوکیتان هەیە دەبێ بیهێنن بۆم ، دیارە پرسیاری لە نەژادو بەسەرهاتیان کردووەو وتویانە برایەکی باوکیشمان هەیەو لای باوکمانە ﴿الا ترون أني أوفي الكيل﴾ ئایا نابینن کە من بە تێروتەسەلی پێوانەو بارتان ئەدەمێ و، میوانداریشم کردن ﴿وانا خير المنزلين﴾ و من چاکترین خانە خوێ بووم بۆتان، باشترین میوانداریم کردن، مەبەستی هەڵنانیانەو، تەماح خستنە بەردەمیان ﴿٦٠ فإن لم تأتوني به﴾ جا ئەگەر ئەمجارە هاتنەوە ئەوتان بۆ نەهێنام ﴿فلا كيل لكم عندي﴾ جیرەو پێوانەتان لای من نیەو هیچتان نادەمێ، دەیەوێ کەمێکیش ترس بخاتە بەریان ﴿ولا تقربون﴾ و نزیکیشم مەکەونەوە بێ ئەو ﴿٦١ قالوا سنراود عنه أباه﴾ ئەوانیش دەیانزانی کاتی خۆیشی چ درۆیەکیان لەگەڵ (یەعقووب)ی بابیاندا کردووە سەبارەت بەخۆی، بۆیە ئێستاش وتیان: دڵنیابە هەموو فێڵ و هەوڵێك لەگەڵ باوکیا

دەدەین بۆهێنانی ﴿وإنا لفاعلون﴾ و بێگومانبە کەئێمە هەڵئەسین بەوکارە ﴿٦٢ وقال لفتيانه اجعلوا بضاعتهم فی رحالهم﴾ و یوسف بەو کوڕە لاوانەی گوت لەبەر دەستیا بوون: ئەو دراوەیش بۆشت کرینیان هێنابوو، بێدەنگێك بیخەنەوە ناوبارەکانیان ﴿لعلهم يعرفونها إذا انقلبوا إلى اهلهم﴾ بەشکو کاتێ گەڕانەوە لای ماڵ و منداڵی خۆیان بیناسنەوەو، پێی بزانن. ﴿لعلهم يرجعون﴾ بەڵکو – پاش ئەوە گەرانەوەو بینییان – بگەرێنەوە لامان .

**ڕێنمایەکانی ئایەتی (٥٨-٦٢):**

١- خوا بیەوێ کارێ بکا، هۆکانیشی بۆ ڕێك دەخا: خەودیتنی پاشا، دەست نەکەوتنی کەسێ بۆ ماناکردنی خەونەکەی، پسپۆڕیی یوسف بۆ لێکدانەوەی خەونەکان، سەرهەڵدانی گرانیی و قات و قریی لەوڵاتی (کەنعان)، ناچاربوونی براکانی بەهاتن بۆ میسرو...هتد.

الجزء الثالث عشر — سورة يوسف

قَالَ هَلْ ءَامَنُكُمْ عَلَيْهِ إِلَّا كَمَآ أَمِنتُكُمْ عَلَىٰٓ أَخِيهِ مِن
قَبْلُ فَٱللَّهُ خَيْرٌ حَٰفِظًا وَهُوَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٦٤﴾ وَلَمَّا فَتَحُوا۟
مَتَٰعَهُمْ وَجَدُوا۟ بِضَٰعَتَهُمْ رُدَّتْ إِلَيْهِمْ قَالُوا۟ يَٰٓأَبَانَا
مَا نَبْغِى هَٰذِهِۦ بِضَٰعَتُنَا رُدَّتْ إِلَيْنَا وَنَمِيرُ أَهْلَنَا وَنَحْفَظُ
أَخَانَا وَنَزْدَادُ كَيْلَ بَعِيرٍ ذَٰلِكَ كَيْلٌ يَسِيرٌ ﴿٦٥﴾ قَالَ لَنْ
أُرْسِلَهُۥ مَعَكُمْ حَتَّىٰ تُؤْتُونِ مَوْثِقًا مِّنَ ٱللَّهِ لَتَأْتُنَّنِى بِهِۦٓ إِلَّآ
أَن يُحَاطَ بِكُمْ فَلَمَّآ ءَاتَوْهُ مَوْثِقَهُمْ قَالَ ٱللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٌ
﴿٦٦﴾ وَقَالَ يَٰبَنِىَّ لَا تَدْخُلُوا۟ مِنۢ بَابٍ وَٰحِدٍ وَٱدْخُلُوا۟ مِنْ أَبْوَٰبٍ
مُّتَفَرِّقَةٍ وَمَآ أُغْنِى عَنكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا
لِلَّهِ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَعَلَيْهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ ﴿٦٧﴾ وَلَمَّا
دَخَلُوا۟ مِنْ حَيْثُ أَمَرَهُمْ أَبُوهُم مَّا كَانَ يُغْنِى عَنْهُم
مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ إِلَّا حَاجَةً فِى نَفْسِ يَعْقُوبَ قَضَىٰهَا وَإِنَّهُۥ
لَذُو عِلْمٍ لِّمَا عَلَّمْنَٰهُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ
﴿٦٨﴾ وَلَمَّا دَخَلُوا۟ عَلَىٰ يُوسُفَ ءَاوَىٰٓ إِلَيْهِ أَخَاهُ قَالَ
إِنِّىٓ أَنَا۠ أَخُوكَ فَلَا تَبْتَئِسْ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٦٩﴾

٢٤٣

٢- نەخشە دارشتنی یوسف بۆ هێنانی براو خێزانەکەیان.

٣- ئاسەواری بڕواو تەقوا لە مرۆڤدا.

**دەیانەوێ (بنیامین)یش لەگەڵ خۆیەرن:**

﴿٦٣ فلما رجعوا إلى ابيهم﴾ جا کاتێ کە گەڕانەوە لای باوکیان ﴿قالوا يا ابانا منع منا الكيل﴾ وتیان: بابە! پێوانەی رزق و ڕۆزیمان لێگیراوە ئەگەر ئەمجارە بینامین لەگەڵ خۆمان نەبەین ﴿فأرسل معنا اخانا نكتل﴾ دەسا تۆش مەگەر براکەمان لەگەڵ بنێریت ، تاپێکەوە ئازووقەو ڕۆزیی وەرگرین ﴿وإنا له لحافظون﴾ بێگومانیشبە ئێمە پارێزگاری لێدەکەین، دیارە ئەو دەمەش کە فرو فێڵەکەیان بەرامبەر یوسف کرد گوتیان: (ارسله معنا غدا يرتع ويلعب وإنا له لحا فظون) کەچی راستیشیان نەکرد! بۆیە ﴿٦٤ قال هل آمنكم عليه﴾ وتی: جا دەکرێت (بنیامین) یشتان پێ بسپێرم و بڕواتان پێ بکەم و دڵنیابم لێتان ﴿إلا كما امنتكم على أخيه من قبل﴾ هەر وەکو جاری پێشوو براکەیم پێتان سپارد، واتە: کاتی خۆی (یوسف)یشتان بردو، ئاواشتان بەسەر هێنا؟! ﴿فالله خير حافظا﴾ من بڕوام بەپاراستنی ئێوە نیە، بەڵکو چاکتر پارێزەر هەرخوایەو ئەیدەمە دەستی ئەو ﴿وهو ارحم الراحمين﴾ ئەویش لەهەموو خاوەن بەزەییەك، بە بەزەیی ترە، واتە: بەتەمای ڕەحم و بەزەیی خوام.

**دراوەکەیان دەسکەوتەوە:**

﴿٦٥ ولما فتحوا متاعهم﴾ جا کە بارەکەیان دوای حەوانەوەو قسەوباس و ئیسراحەت کردەوە ﴿وجدوا بضاعتهم ردت إليهم﴾ دەبینن شت و مەك و پارەو پووڵ و دەست مایەکەشیان بۆ گێردراوەتەوە ﴿قالوا يا ابانا مانبغي هذه بضاعتنا ردت إلينا﴾ گوتیان: بابە! چیمان دەوێ ، ئەمەش پارەو پووڵ و کەل و پەلەکەمانە نێردراوەتەوە بۆمان و، دانەوێڵەی باشیشمان هێناوە؟ ﴿ونمير اهلنا﴾ و ئەگەر براکەشمان لەگەڵ بنێریت،

ئەمجارەش بژێویی و خواردن و خۆراك بۆ خاوو خێزانمان دەهێنین ﴿ونحفظ آخانا﴾ و براکەیشمان بنیامین ئەپارێزین لەهەر شتێکی خراپ ﴿ونزداد کیل بعیر﴾ بەهۆی ئەویشەوە پێوانەی باری وشترێکیش زیاد دێنین ﴿ذلك کیل یسیر﴾ ئەوەیش بۆ پاشا پێوانەیەکی کەمە، چونکە خاوەن بەخششە ﴿[٦٦] قال لن أرسله معکم حتی تؤتونی موثقا من الله﴾ یاقووب وتی: هەرگیز لەگەڵتانی نانێرم تاپەیمانێکی پتەوم بەناوی خواوە نەدەنێ ﴿لتأننی به﴾ کە هەردەبێ بیوەی بۆمی بهێننەوە ﴿إلا ان یحاط بکم﴾ مەگەر لەگش لایەکەوە داگیر بکرێن و دەسەڵاتتان نەمێنێ، مردن یاهەر شتێ تر بێتە رێتان ﴿فلما اتوه موثقهم﴾ جا کە پەیمانێکی پتەویان دایە ﴿قال الله علی ما نقول وکیل﴾ یەعقووب وتی: لەم قسەو باسەمان خوای گەورە ئاگادارو چاودێرە، ئەمیش دەدەمە دەستی خوا، دەسا بچن خوا بتانپارێزێ.

## یاقووب دەڵێ: لەیەك دەرگاوە مەچنە ناو:

﴿[٦٧] وقال یا بنی لا تدخلوا من باب واحد﴾ باوکیان وتی: کوڕەکانم! کەنزیکی شار دەبنەوە، هەموو پێکەوە لەیەك دەرگاوە مەچنە ناو شارەوە. بەڵێ.. لەبەر هەر هۆیەك بوو(یەعقووب) وەکو سۆزی باوکایەتی–ئەو وەسیەتەی بۆکوڕەکانی کرد؟ هەرچەندە گەلێ تەفسیرو ریوایەت هەیە بۆدیاریکردنی هۆیەکەی، وە هەریەکەشیان شتێك دەڵێت، بێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوە هەبێ و، لەگەڵ دەقی قورئانەکەدا بگونجێت! خۆ گومانیش لەوەدا نییە کە ئەگەر ئەوشتەی وا یەعقوب کوڕەکانی خۆی لێ دەپارێزێ (چاو)ی پیس بوایە، (وەك ئەوانە دەڵێن)، وەیان هەرشتێکی تری دیاریی، ئەوا ئەو کاتە قورئانەکە خۆی دیاریی دەکرد، خۆ ئاشکرایە لەم قورئانەدا تەنها هەر ئەوەندە هاتووە کە فەرمووی: (إلا حاجة فی نفس یعقوب قضاها) واتە: تەنها نیازو سۆزێکی دەروونیی بوو لە دڵی (یاقووب)دا، بەرامبەریان درکانی و هیچی تر، کەوابوو دەبێ راڤەکەرانی قورئانیش لەوسنوورەدا بووەستن و پەنجە نەخەنە سەر هیچ شتێك و راسپاردەکەش وەك خۆی بەرەهاو بەرفراوانی بهێڵنەوە، دیارە هەر ئەمەش شیاوە بۆ ڕاگرتنی ئەدەب و وێڵ لەگەڵ قورئاندا. هەمووشمان چاك دەزانین کە یەعقوب ﷺ بەرامبەر کوڕەکانی مەترسی شتێکی هەبوو بۆیان ئەگەر لەیەك دەرگاوە بچنە ناو شاری میسرەوە هەرچەندە راسپاردەکەش هیچ بڕیارێکی خوای پێ بەرپەرچ نەدرایەوە.. کەوابوو بۆ ئێمەیش هەروا چاکە کە ئەو وەسیەت و راسپاردەیە بە رەها بهێڵینەوەو دیاریی نەکەین و، هەرتەنها لەگەڵ دەقی قورئانەکەدا بڕۆین ﴿وادخلوا من أبواب متفرقة﴾ و لەدەروازەی جیا جیاوەوە بچنە ژوورەوە ﴿وما أغنی عنکم من الله من شئ﴾ هەرچەندە من بەم تەگبیرو راوێژانەش ناتوانم هیچ قەزاو بڕیارێکی خوا لەئێوە دوور بخەمەوە خۆی چۆنی بڕیار دابێت، هەرگیز ناگۆڕدرێ و هەرواش دەبێت ﴿إن الحکم إلا لله﴾ چونکە بڕیارو فرمان تەنها بۆ خوایەو بەس ﴿علیه توکلت﴾ پشتم بەو بەستووە ﴿وعلیه فلیتوکل المتوکلون﴾ جا کەسانێکیش کە هەر ئەو بەشیاوو بەکار ساز دەزانن، دەبا تەنها پاڵ بەوەوە بدەن و پشت بەو ببەستن.

### ڕێنمایەکانی ئایەتی (٦٣–٦٧):

١– تەوەککولی تەواوی یەعقووب ﷺ بەرامبەر بەخوای خۆیی و، ناسینی ئەسماو سیفەتەکانی وەك شیاویەتی، هەقیشە وابێ، چونکە یەکێکە لەپێغەمبەرانی خوا ﷺ .

٢– وەرگرتنی پەیمان و مۆرو ئیمزا بۆ کارە گرنگەکان، هەرچەند لەبەرامبەر خزمانی نزیکیشەوە بێ.

٣– خۆ پاراستن لە (چاو)ی پیس هیچ زیانێکی نیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر دەبێ بڕوات وابێ کە ئەوەیش لەحوکم و بڕیارەکانی خوا هیچ شتێ ناگۆڕێ.

٤- پشت تەنها بە خوا ببەستەو، ئیتر بەدڵنیاییەوە کارەکانت راپەڕێنە.

﴿[٦٨] ولما دخلوا من حيث امرهم ابوهم﴾ جاکە لەو جێیەوە باوکیان بۆی دیاریکردن بە جیاجیا چوونە ژوورێ ﴿ما كان يغني عنهم من الله من شئ﴾ و ئەوکارەیان هیچ بریارێکی خوایی لێدوور نەخستنەوەو بێ نیاز ی نەکردن، بەڵکو بڕیاری خۆی لە (ئەزەل)دا چۆن بوو هەرئەوە دەبێ، وەکو دەفەرموێ: ﴿إلا حاجة في نفس يعقوب قضاها﴾ تەگبیرو رێنماییەکە بێ کەڵك بوو و، جێگەی هیچی بۆنەگرتن، ئەمە نەبێت کە لەدڵ و دەروونی یەعقوبدا نیازو پێویستیەکی باوکایەتی هەبوو بیڵێت، ویستی لەومەترسییە خۆی بیری لێکردبوویەوە ئامۆژگارییان بکاو خۆیانی لێلا بدەن، راسپاردەو وەسیەتیشی بۆ کردن، بەڵام قەزاو بریاری خوای رەت نەکردەوە، ﴿وإنه لذو علم لما علمناه﴾ چونکە ئەو خاوەن زانیارییەکی فراوان بوو، لەوەی فێرمان کردبوو ﴿ولكن اكثر الناس لا يعلمون﴾ بەڵام زۆربەی خەڵکی ئەوەی ئەو دەیزانێ نایزانن.

**یووسف دڵی بنیامین دەداتەوە:**

﴿[٦٩] ولما دخلوا على يوسف﴾ کاتێ کورەکانی یەعقوب لەماڵی یوسف چوونە ژوورەوە ﴿آوى إليه اخاه﴾ (بنیامین)ی برای بردە لای خۆی و لەژوورەکەی خۆی داینا و حەوانیەوەو لەرابردو ئاگاداری کردو ﴿قال إني انا اخوك﴾ گوتی: بێگومانبە من برایەکەی تۆم (یوسف) ﴿فلا تبتئس بما كانوا يعملون﴾ جالەوەی ئەوان پێیان کردیت ساڵەکانی رابردوو دڵ زوویرو غەمگین مەبە، تێیشیگەیاند کەلای خۆی دەیهێڵێتەوەو نابێ ئەم نهێنیە لای کەس بدرکێنێ.

**یوسف ئاو خۆری پاشا دەخاتە ناو باری براکەیی و گلی دەداتەوە:**

﴿[٧٠] فلما جهزهم بجهازهم﴾ ئینجا کاتێ باری بۆ رێکخستن و ئامادەی گەڕانەوە بوون ﴿جعل السقاية في رحل اخيه﴾ ئاوخۆری پاشا کە لەزیو بوو، یا ئەومەنەی کە (عەیارەی) دانەوێڵەیان پێدەگرت، خستیە ناو باری براکەیەوە ویستی بەوە رێخۆشکات بۆ گلدانەوەی (بنیامین) لای خۆی! ﴿ثم اذن مؤذن﴾ لەپاشا جارکێشێك جاری راهێشت و گوتی: ﴿ايتها العير إنكم لسارقون﴾ ئەی کاروانچییەکان! بێگومان ئێوە دزن و دزیتانکردووە! ﴿[٧١] قالوا واقبلوا عليهم﴾ ئەوانیش روویانکردە جارچییەکان و گوتیان: ﴿ماذا تفقدون﴾ چیتان لێگوم بووەو نەماوە؟ ﴿[٧٢] قالوا نفقد صواع الملك﴾ وتیان: مەنی پێوانەی پاشامان ونکردووە ﴿ولمن جاء به حمل بعير﴾ و هەرکەسیش پەیدای بکاو بیهێنێتەوە، باری وشترێك خۆراك و دانەوێڵەی دەدرێتێ وەکو رێزانەو بەخشش ﴿وانا به زعيم﴾ منیش بۆخۆم دەسەبەری ئەو خەڵاتەم و لە ئەستۆی دەگرم.

الجزء الثالث عشر — سورة يوسف

فَلَمَّا جَهَّزَهُم بِجَهَازِهِمْ جَعَلَ السِّقَايَةَ فِي رَحْلِ أَخِيهِ ثُمَّ
أَذَّنَ مُؤَذِّنٌ أَيَّتُهَا الْعِيرُ إِنَّكُمْ لَسَارِقُونَ ﴿٧٠﴾ قَالُوا وَأَقْبَلُوا
عَلَيْهِم مَّاذَا تَفْقِدُونَ ﴿٧١﴾ قَالُوا نَفْقِدُ صُوَاعَ الْمَلِكِ
وَلِمَن جَاءَ بِهِ حِمْلُ بَعِيرٍ وَأَنَا بِهِ زَعِيمٌ ﴿٧٢﴾ قَالُوا تَاللَّهِ
لَقَدْ عَلِمْتُم مَّا جِئْنَا لِنُفْسِدَ فِي الْأَرْضِ وَمَا كُنَّا سَارِقِينَ
﴿٧٣﴾ قَالُوا فَمَا جَزَاؤُهُ إِن كُنتُمْ كَاذِبِينَ ﴿٧٤﴾ قَالُوا جَزَاؤُهُ
مَن وُجِدَ فِي رَحْلِهِ فَهُوَ جَزَاؤُهُ كَذَٰلِكَ نَجْزِي الظَّالِمِينَ
﴿٧٥﴾ فَبَدَأَ بِأَوْعِيَتِهِمْ قَبْلَ وِعَاءِ أَخِيهِ ثُمَّ اسْتَخْرَجَهَا مِن
وِعَاءِ أَخِيهِ كَذَٰلِكَ كِدْنَا لِيُوسُفَ مَا كَانَ لِيَأْخُذَ أَخَاهُ
فِي دِينِ الْمَلِكِ إِلَّا أَن يَشَاءَ اللَّهُ نَرْفَعُ دَرَجَاتٍ مَّن نَّشَاءُ
وَفَوْقَ كُلِّ ذِي عِلْمٍ عَلِيمٌ ﴿٧٦﴾ ۞ قَالُوا إِن يَسْرِقْ الحزب ٢٥
فَقَدْ سَرَقَ أَخٌ لَّهُ مِن قَبْلُ فَأَسَرَّهَا يُوسُفُ فِي نَفْسِهِ
وَلَمْ يُبْدِهَا لَهُمْ قَالَ أَنتُمْ شَرٌّ مَّكَانًا وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا
تَصِفُونَ ﴿٧٧﴾ قَالُوا يَا أَيُّهَا الْعَزِيزُ إِنَّ لَهُ أَبًا شَيْخًا كَبِيرًا
فَخُذْ أَحَدَنَا مَكَانَهُ إِنَّا نَرَاكَ مِنَ الْمُحْسِنِينَ ﴿٧٨﴾

٢٤٤ قال معاذ

رێنماییەکانی ئایەتی (٦٨-٧٢):

١- فەزڵی زانست و زانیاران.

٢- زۆربەی خەڵکی هەمیشە بەکارە چاکەکان نەزانن.

٣- کارامەیی و لێهاتوویی یوسف لە راوێژو تەگبیر بۆ هێشتنەوەی (بنیامین) لای خۆی.

٤- رێزانەو (موکافەئە) بۆ هەرکەسێ کارێکی تایبەتی بدرێتێ و، بەچاکی پێی هەڵسێ، کەئەمە لە فیقهیشدا پێیدەڵێن: (جەعالە).

٥- دەسەبەریی و، دەسە بەربوون (کەفالە) و (کەفیل) بۆ هەندێ ئیش و کار سەلمێنراوە. ﴿٧٣ قالوا تالله لقد علمتم ما جئنا﴾ ئەوانیش وتیان: سوێند بەخوا ئێوە چاك دەزانن کە ئێمە بۆ ئەوە نەهاتووین ﴿لنفسد فی الأرض﴾ لەم زەوییەدا خراپەو گێرە شێوێنی و، کاری بەدفەڕی و فەساد بکەین ﴿وما کنا سارقین﴾ رۆژێکیش ئێمە قەت دز نەبووینە ﴿٧٤ قالوا فما جزاؤه إن کنتم کاذبین﴾ دەس و پێیانی پاشا وتیان: جا ئەگەر ئێوەش درۆزن بوون، تۆڵەی چییە؟ ﴿٧٥ قالوا جزاؤه﴾ دەس و پێیانی پاشا وتیان: تۆڵەکەی ئەمەیە: ﴿من وجد فی رحله فهو جزاؤه﴾ ئەو پێوانە لەباری هەر کەسێکا دەرکەوت، هەر ئەوکەسە بۆخۆی تۆڵەی بێت، واتە: دەکرێتە کۆیلەو بەندە ﴿کذلك نجزی الظالمین﴾ بەم شێوەیە تۆڵە لەگشت ستەمکاران وەردەگرین، دەبێ ببنە بەندە. بەڵێ.. لەشەریعەتی (یەعقووب)دا هەرکەسێك دزی کردبا، دەبوو لەباتی دەست برینی، کرابایە بەندە ﴿٧٦ فبدأ بأوعیتهم قبل وعاء أخیه﴾ ئینجا ئەوەی کاری پشکنینی پێ سپێردرابوو، (یان هەر بڵێین یوسف خۆی) پێش پشکنینی بارەکەی (بنیامین)ی برای، دەستی دایە پشکنینی باری براکانی تری، هەتا گومان نەبەن بەکارەکەی یوسف ﴿ثم استخرجها من وعاء أخیه﴾ پاشان لەناو کەل و پەلی(بنیامین)ی برایدا ئاو خۆرەکەیان هێنایە دەروو دۆزییەوە ﴿کذلك کدنا لیوسف﴾ ئاوا ئێمە نەخشەو پلانمان ئەنجامدا بۆ یوسف، هەتا (بنیامین)ی برای لای خۆی بهێڵێتەوە، کەوابوو بەپێی ئایەتی (..کدنا لیوسف..) مرۆڤ دەتوانێ بۆ گەیشتن بەهەندێ مەبەستی شەرعیی، هەر رێگەیەکی شیاوو گونجاو بگرێتە بەر، بەمەرجێ لەگەڵ شەریعەتدا دژ نەوەستێ. ﴿ماکان لیأخذ أخاه فی دین الملك﴾ لە بەرنامەی پاشای میسردا نەدەبوو یوسف براکەی خۆی بگرێ و گلی بداتەوە لای خۆی لەباتی دزییەکە بەڵکو تەنها ئەوەندەی بۆ هەبوو کە برێکی لێبداو، دووقاتیش پێی ببژێرێ، بەڵام لەشەریعەتی (یعقووب)ی باوکیدا ئەو کارەیە هەبوو، بۆیە کردی ﴿إلا أن یشاء الله﴾ مەگەر خوا واحەز بکا، بۆیە براکانیشی ملیان بۆراکێشاو تەسلیم بوون ﴿نرفع درجات من نشاء﴾ دیارە بمانەوێ هەرکەسێك سەرخەین ، پلە بەپلە بەرزی دەکەینەوەو دەیگەیەنینە جێگای شیاوی خۆی ﴿وفوق کل ذی علم علیم﴾ خۆ لە بان هەموو زانایەکەوە زاناتر هەیە، هەتا دەگاتە لای خوا، ئیتر لەخوا زاناتر نییە.

**یووسف تاوانبار دەکەن بە دزی:**

﴿٧٧ قالوا إن یسرق﴾ براکانی بە(یوسف)یان گوت: ئەگەر ئەو ئێستا دزی بکا، جێی سەرسوڕمان نییە ﴿فقد سرق أخ له من قبل﴾ بەر لەمیش برایەکی هەبوو، ئەویش دزیکرد، مەبەستیان لە یوسف خۆیەتی ﴿فأسرها یوسف فی نفسه ولم یبدها لهم﴾ یوسفیش ئەو وشەیەی لەدڵگرت و لێیشاردنەوەو بێدەنگ بوو، لێرەدا یوسف لەدڵی خۆیدا ﴿قال أنتم شر مکانا﴾ گوتی: ئێوە زۆر خراپترن لەوان ﴿والله أعلم بما تصفون﴾ ئەو قسەیەش ئێوە وەسپی ئەوی پێدەکەن، خوا لەهەموو کەسێ چاکتر بەراستییەکەی دەزانێ.

**داوا دەکەن لەباتی بنیامین، یەکێ تریان گل بداتەوە:**

﴿٧٨ قالوا یاأیها العزیز إن له أبا شیخا کبیرا﴾ کە زانییان یوسف سوورە بۆ گلدانەوەی (بنیامین) لای خۆی گوتیان: ئەی عەزیز! بێگومان ئەو کوڕەیە باوکێکی پیری خاوەن رێزو بەحورمەتی هەیە، هۆگری بووەو، هەرگیز بێ

ئەو توانای ژیانی نییە ﴿فخذ احدنا مكانه﴾ لەبەر ئەوە یەكێ لەئێمە لەجێی ئەودا گل بدەرەوە ﴿إنا نراك من المحسنين﴾ بەراستیی ئێمە تۆ لەڕیزی خێرەومەندان دەبینین ﴿^٧٩ قال معاذالله ان ناخذ إلا من وجدنا متاعنا عنده﴾ یوسف گوتی: ئەی پەنا بەخوا، ئەر ئێمە بەدەر لەوكەسە كالاكەمانی لابووە، كەسێكی تر لەباتی ئەو گل بدەینەوە ﴿إنا إذا لظالمون﴾ گەر ئەوە بكەین ئێوە دەیڵێن، بێگومان دەبینە خەڵكی ناهەقكارو ستەمكار.

**ڕێنمایەكانی ئایەتی(٧٧-٧٩):**

١- پۆزش هێنانەوەو داوای لێبووردن لەگشت كارێكی هەڵە.

٢- پیاوی بەحیلەو هێمنیش، هەندێ جار ناچاردەكرێت جۆرە قسەیە بكات.

٣- داواكردنی عەفوو و، داخوازیی رەحم و بەزەیی بۆكەسێك پێویست بێت، لە چوارچێوەی شەریعەتی خوادا كارێكی رەوایە.

٤- وازهێنان لەكەسێكی تاوانكارو ئازادكردنی ئەو و، گرتنی كەسێكی تر لەباتیدا لەشەریعەتی ئیسلامدا حەرامە.

**دەكەونە مەشۆرەت لەگەڵ گەورەكەیاندا:**

﴿^٨٠ فلما استيئسوا منه خلصوا نجيا﴾ جاكە بێ هیوا بوون یوسف بنیامین ئازادكا ئەوجا لە خەڵكەكە دووركەوتنەوەو كەوتنە چپەو سرتە سرت و دۆزینەوەی چارەسەرێك ﴿قال كبيرهم الم تعلموا ان اباكم﴾ برا گەورەكەیان هەڵیدایەو گوتی: مەگەر ئێوە نازانن و لەبیرتان نەماوەكە باوكتان ﴿قد اخذ عليكم موثقا من الله﴾ پەیمانێكی بتەوی بەناوی خوا لێوەرگرتن كە(بنیامین)بپارێزن و بیبەنەوە بۆی ﴿ومن قبل ما فرطتم فی یوسف﴾ و خۆبەر لەوەش لەڕادە بەدەر دەربارەی یوسف خراپەتانكرد! ﴿فلن ابرح الأرض حتى يأذن لی ابی﴾ جا لەبەر ئەوە دڵنیابن كەهەرگیز من لەم وڵاتی (میسر)ـە ناچمە دەرێ، هەتا بابم ئیزن دەدا بەگەڕانەوەم، چونكە شەرمەزاریە بۆم بەو هەواڵەوە بچمەوە بۆلای ﴿او يحكم الله لی وهو خير الحاكمين﴾ یان خوا بڕیارێكی نوێم بۆ دەدا، واتە: بە بنیامینەوە دەگەڕێمەوە، خۆ خوایش لەهەموو بڕیاردەرێك چاكترە ﴿^٨١ إرجعوا الی ابيكم﴾ دەسا ئێوە بچنەوە بۆلای باوكتان ﴿فقولوا يا ابانا إن ابنك سرق﴾ بڵێن: بابە! بەڕاستی (بنیامین)ـی كوڕت دزیی كرد! ﴿وما شهدنا إلا بما علمنا﴾ خۆ تائێستایش شایەتیمان بۆ هیچ شتێ نەداوە، مەگەر بەچاو بینیبێتمان، واتە: بەچاوی خۆمان دیتمان كە ئاوخۆرەكەی پاشا لەناو بارەكەی ئەودا بوو، ئەوجا بەبڕیاری هەمووومان كردیان بە بارمتەی ئەو ﴿وما كنا للغيب حافظين﴾ خۆ ئێمە ئاگاشمان لە شتی نادیار و غەیب نەبوو، كاتێ كە پەیمانمان بە تۆدا نەمانزانی دزی دەكا هەتا نەیبەین و، ئێستاش ڕوو زەردی لای تۆ نەبین ﴿^٨٢ واسأل القرية التی كنا فيها﴾ بۆ دڵنیایی خۆیشت بپرسە لەخەڵكی ئەوشارە كەئێمەی لێبووین ﴿والعير التی

سُورَةُ يُوسُفَ — الجزء الثالث عشر

قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِ أَن نَّأْخُذَ إِلَّا مَن وَجَدْنَا مَتَٰعَنَا عِندَهُۥٓ إِنَّآ
إِذًا لَّظَٰلِمُونَ ﴿٧٩﴾ فَلَمَّا ٱسْتَيْـَٔسُوا۟ مِنْهُ خَلَصُوا۟ نَجِيًّا
قَالَ كَبِيرُهُمْ أَلَمْ تَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ أَبَاكُمْ قَدْ أَخَذَ عَلَيْكُم
مَّوْثِقًا مِّنَ ٱللَّهِ وَمِن قَبْلُ مَا فَرَّطتُمْ فِى يُوسُفَ فَلَنْ أَبْرَحَ
ٱلْأَرْضَ حَتَّىٰ يَأْذَنَ لِىٓ أَبِىٓ أَوْ يَحْكُمَ ٱللَّهُ لِى وَهُوَ خَيْرُ ٱلْحَٰكِمِينَ
﴿٨٠﴾ ٱرْجِعُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَبِيكُمْ فَقُولُوا۟ يَٰٓأَبَانَآ إِنَّ ٱبْنَكَ سَرَقَ
وَمَا شَهِدْنَآ إِلَّا بِمَا عَلِمْنَا وَمَا كُنَّا لِلْغَيْبِ حَٰفِظِينَ
﴿٨١﴾ وَسْـَٔلِ ٱلْقَرْيَةَ ٱلَّتِى كُنَّا فِيهَا وَٱلْعِيرَ ٱلَّتِىٓ أَقْبَلْنَا فِيهَا
وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴿٨٢﴾ قَالَ بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ أَنفُسُكُمْ أَمْرًا
فَصَبْرٌ جَمِيلٌ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَأْتِيَنِى بِهِمْ جَمِيعًا إِنَّهُۥ هُوَ
ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٨٣﴾ وَتَوَلَّىٰ عَنْهُمْ وَقَالَ يَٰٓأَسَفَىٰ عَلَىٰ
يُوسُفَ وَٱبْيَضَّتْ عَيْنَاهُ مِنَ ٱلْحُزْنِ فَهُوَ كَظِيمٌ ﴿٨٤﴾
قَالُوا۟ تَٱللَّهِ تَفْتَؤُا۟ تَذْكُرُ يُوسُفَ حَتَّىٰ تَكُونَ حَرَضًا
أَوْ تَكُونَ مِنَ ٱلْهَٰلِكِينَ ﴿٨٥﴾ قَالَ إِنَّمَآ أَشْكُوا۟ بَثِّى
وَحُزْنِىٓ إِلَى ٱللَّهِ وَأَعْلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٨٦﴾

٢٤٥

﴿اقبلنا فيها﴾ و لەو کاروانەش پێکەوە هاتینەوە ﴿وإنا لصادقون﴾ و بێگومانیش بە سەبارەت بە هەواڵەکەی بنیامین ڕاستدەکەین.

**یاقووب دەبیسێ بنیامین گلدراوەتەوە:**

﴿٨٣ قال بل سولت لكم انفسكم امرا﴾ یاقووب گوتی: نەخێر، وانییە، کوڕی من دزی نەکردووە، بەڵکو نەفستان ئەم قسەیەی لاشیرین کردوون و، ئێوەیش دەتانەوێ منی پێ بخەڵەتێنن! ﴿فصبر جميل﴾ دیسانەوە منیش تەنها ئارام گرتنێکی بێ ناشکوری و جوانم بۆخۆم هەڵبژاردووە لەبەرامبەر ئەم تاقیکردنەوەیەشدا ﴿عسى الله ان يأتيني بهم جميعا﴾ هیوادارم، ئەوخوایە هەموویانم (یوسف، بنیامین، ڕۆبیلی براگەورەکەیان) بۆ بهێنێتەوەو گشت پێکەوە کۆببینەوە ﴿إنه هو العليم الحكيم﴾ چونکە بە ڕاستیی ئێستا تەنها ئەو چاك دەزانێ بەحاڵی من، ئەویش کارجوان و لەکارزانەو بڕیار دەدات ﴿٨٤ وتولى عنهم﴾ ئیتر یەعقوب لە ناو خەفەتدا لە کوڕەکان ڕووی وەرچەرخان ﴿وقال يا اسفى على يوسف﴾ وتی: ئای، ئۆف و، ئەسەف غەم وخەفەت، ئەی داخم بۆ یوسف! ئەوا زامەکەی ئەویشم کولایەوە. (سەعید)ـی کوڕی (جوبەیر) دەڵێت: زیکری (إنا لله وإنا إليه راجعون) تەنها خەڵاتی ئەم ئوممەتەیە، نابینی (یاقووب) چیگوت! ﴿وابيضت عيناه من الحزن﴾ جا لە سۆوخەم و خەفەتدا (تانە) ئاوی سپی پەڕییە سەر هەردوو چاوی ﴿فهو كظيم﴾ و ئیتر بێدەنگ بۆخۆی دانیشت و، چاوەڕوانی خوا بوو دەرووی خێری لێبکاتەوە.

ڕێنمایەکانی ئایەتی (٨٠-٨٤):

١- کۆکردنەوەو بانگکردنی خەڵکانی بەفام و ژیر بۆ مەشوەرەت و توێژینەوەی هەندێ ڕووداوو کاری گرنگ.

٢- وەبیر هێنانەوەی پەیمان و ڕێکەوتننامە بۆ پاراستنی.

٣- گەلێ جار حەیاو شەرم زاڵ دەبێ بەسەر موسڵمانداو، لەهەندێ شتی باش و چاك بێبەشی دەکا.

٤- تۆمەتبارکردنی مرۆڤی بێ تاوان، لەبەر گومان و هەندێ شت کە پێشتر لەلای بینراوە.

٥- بردنی سکاڵاو خەم و خەفەت تەنها بۆلای خوا دەبرێ. ﴿٨٥ قالوا تالله تفتؤا تذكر يوسف﴾ کوڕەکان وتیان: ئەمە چی بوو باسی (یوسف)ت هەر نەبڕیەوە، سوێن بەخوا تۆ قەت یوسف لەبیر ناکەیت ﴿حتى تكون حرضا اوتكون من الهلكين﴾ نەخۆش دەکەویت، یان ئەتکوژێت ﴿٨٦ قال إنما اشكو بثي وحزني إلى الله﴾ یەعقووب وتی: من خەم و پەژارەی خۆم تەنها لای خوا دەبەم ﴿واعلم من الله ما لا تعلمون﴾ و ئەوەی من لەخواوە دەیزانم ئێوە نایزانن، بۆیە هیوام زۆرەو چاکیش دەزانم کە خەوەکەی یوسف ڕاستەو، دەبێ منیش و ئێوەش، هەموو کڕنووشی بۆ بەرین.

**یەعقوب فەرمان دەدا بە سۆراخی یوسف و بنیامین:**

﴿٨٧ يا بني اذهبوا فتحسسوا من يوسف واخيه﴾ یەعقوب وتی: کوڕەکانم! بڕۆن بۆ میسر، لەوێ هەوڵی زۆربدەن بۆ جێ پێ هەڵگرتنی (یوسف) و براکەی، بەڵکو سۆراخێکیان بکەن ﴿ولا تيأسوا من روح الله﴾ هەرگیز نائومێدیش مەبن لە ڕەحم و بەزەیی ﴿إنه لايَيْئَسُ من رَوح الله إلا القوم الكافرون﴾ چونکە مەگەر هەر خوانەناس و بێباوەڕان لەڕەحم و میهرەبانی خوا بێ هیواو نائومێد بن ﴿٨٨ فلما دخلوا عليه﴾ جا کە گەیشتنە (میسر)و چوونە لای یوسف ﴿قالوا يا ايها العزيز﴾ وتیان: ئەی عەزیزو پاشای میسر! ﴿مسنا واهلنا الضر﴾ هەم خۆمان و، هەم بنەماڵەکەمان تووشی گرانیی و برسێتی بووین ﴿وجئنا ببضاعة مزجاة﴾ و بەهاو دراوێکی کەمیشمان لەگەڵ خۆ هێناوە بۆ بارەگاکەت ﴿فأوف لنا الكيل و تصدق علينا﴾ جا تۆیش وەك جاران مەن و پێوانەکەمان بۆ پڕبکەو، لەخێری خۆت زیادەشمان بۆ بکە سەر ﴿إن الله يجزي المتصدقين﴾ بەڕاستیی خوا پاداشی خێرۆمەندان ئەداتەوە.

**ڕێنمایەکانی ئایەتی (٨٥-٨٨):**

١- خەم و خەفەتی زۆر، مرۆڤ بەرەو نەخۆشیی و، مردن دەبا.

٢- سکالاّ دەبێ تەنها لای خوا ببرێ.

٣- بێ هیواو بێ ئومێدی لەدەرووی خێر لەکاتی تەنگانەدا حەرامە.

٤- سکالاّ بە مەبەستی دەرخستنی نەخۆشیی، وە یا هەر پێویستییەك لەبەر چارەسەر وەك ئەوە لای دکتۆر بگوترێ دروست و ڕەوایە.

٥- فەزڵ و گەورەیی سەدەقەو، پاداشی ئەهلی سەدەقە.

**یووسف خۆی دەناسێنێ بە براکانی:**

﴿[89] قال هل علمتم ما فعلتم بيوسف واخيه﴾ یوسف وتی: زانیتان کاتی خۆی چیتان بەسەر یوسف و براکەی هێنا؟ ﴿إذ انتم جاهلون﴾ ئەودەمەی ئێوە بەراستییەکان نەزانبوون؟ ئەوانیش بەسەر سوڕمانێکەوە! ﴿قالوا إنك لأنت يوسف﴾ گوتیان: مەگەر تۆ (یوسف)یت ؟! ﴿قال انا يوسف وهذا اخي﴾ وتی: بەلێ.. من (یوسف)م و، ئەمەیش (بنیامین)ی برامە ﴿قد من الله علينا﴾ خوا منەتی نایە سەرمان و، وائێستا لێرە کۆیکردینەوە ﴿إنه من يتق ويصبر﴾ چونکە هەرکەس لەخوا بترسێ و خۆ ڕاگرێ لەبەردەم تاقیکردنەوەکانیدا، وە ئەوەش پاداشتی خوایە بۆمن لەبەر چاکەکاریم ﴿فإن الله لا يضيع اجر المحسنين﴾ بەراستیی خوایش پاداشی چاککاران نافەوتێنێ و بزری ناکاو، بەشیاوی خۆیان پاداشیان دەداتەوە ﴿[91] قالوا تالله لقد آثرك الله علينا﴾ براکانی وتیان: سوێند بەخوا، خوا فەزڵ و ڕێزیدایت بەسەر ئێمەدا، بەهۆی تەقواو کرداری شیرین و ئارام و زانیاریی و هێمنیی خۆتەوە ﴿وإن كنا لخاطئين﴾ و ئەمەش ڕاستیبێ ئێمە هەڵەکارو تاوانبار بووین بەرامبەر بە تۆ ﴿[92] قال لا تثريب عليكم اليوم﴾ یوسف وتی: تازە ئەمڕۆ ئێوە هیچ جۆرە گلەییەکتان لەسەرنیەو، ڕابووردوو پێچرایەوە ﴿يغفر الله لكم﴾ خوا لەخەتاتان خۆش بێت ﴿وهو ارحم الراحمين﴾ ئەوە ئەو بۆخۆیشی لەهەموو میهرەبانان بەبەزەیی ترو میهرەبانترە.

الجزء الثالث عشر | سورة يوسف

يَٰبَنِيَّ ٱذۡهَبُواْ فَتَحَسَّسُواْ مِن يُوسُفَ وَأَخِيهِ وَلَا تَاْيۡـَٔسُواْ
مِن رَّوۡحِ ٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ لَا يَاْيۡـَٔسُ مِن رَّوۡحِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ
٨٧ فَلَمَّا دَخَلُواْ عَلَيۡهِ قَالُواْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡعَزِيزُ مَسَّنَا وَأَهۡلَنَا ٱلضُّرُّ
وَجِئۡنَا بِبِضَٰعَةٖ مُّزۡجَىٰةٖ فَأَوۡفِ لَنَا ٱلۡكَيۡلَ وَتَصَدَّقۡ عَلَيۡنَآۖ
إِنَّ ٱللَّهَ يَجۡزِي ٱلۡمُتَصَدِّقِينَ ٨٨ قَالَ هَلۡ عَلِمۡتُم مَّا فَعَلۡتُم
بِيُوسُفَ وَأَخِيهِ إِذۡ أَنتُمۡ جَٰهِلُونَ ٨٩ قَالُوٓاْ أَءِنَّكَ
لَأَنتَ يُوسُفُۖ قَالَ أَنَا۠ يُوسُفُ وَهَٰذَآ أَخِيۖ قَدۡ مَنَّ ٱللَّهُ
عَلَيۡنَآۖ إِنَّهُۥ مَن يَتَّقِ وَيَصۡبِرۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجۡرَ
ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٩٠ قَالُواْ تَٱللَّهِ لَقَدۡ ءَاثَرَكَ ٱللَّهُ عَلَيۡنَا
وَإِن كُنَّا لَخَٰطِـِٔينَ ٩١ قَالَ لَا تَثۡرِيبَ عَلَيۡكُمُ
ٱلۡيَوۡمَۖ يَغۡفِرُ ٱللَّهُ لَكُمۡۖ وَهُوَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ٩٢
ٱذۡهَبُواْ بِقَمِيصِي هَٰذَا فَأَلۡقُوهُ عَلَىٰ وَجۡهِ أَبِي يَأۡتِ بَصِيرٗا
وَأۡتُونِي بِأَهۡلِكُمۡ أَجۡمَعِينَ ٩٣ وَلَمَّا فَصَلَتِ
ٱلۡعِيرُ قَالَ أَبُوهُمۡ إِنِّي لَأَجِدُ رِيحَ يُوسُفَۖ لَوۡلَآ أَن
تُفَنِّدُونِ ٩٤ قَالُواْ تَٱللَّهِ إِنَّكَ لَفِي ضَلَٰلِكَ ٱلۡقَدِيمِ ٩٥

٢٤٦ | فلمّا أن

**یاقووب بۆنی یووسف دەبیسێ:**

﴿[93] اذهبوا بقميصي هذا﴾ جا ئەم کراسەی منە بەرنەوە بۆ باوکم ﴿فألقوه على وجه ابي﴾ و بیخەنە سەر دەم و چاوی باوکم ﴿يأت بصيرا﴾ ئەو حەلە بینایی چاوەکانی دێتەوە، دیارە یوسف هەرچی بکات، بەفەرمان و وەحیی خوا بووە ﴿واتوني بأهلكم اجمعين﴾ پاشانیش هەموو خزم و خێزان و بنەماڵەکەتانم بۆ بێننە میسر ﴿[94] ولما فصلت العير﴾ جاکە کاروانەکە لە میسر دەرچوو بەرەو شام ﴿قال ابوهم إني لأجد ريح يوسف﴾ باوکیان "یەعقوب"

بەوانەی لە دەوروو بەریابوون وتی: بەراستیی من بۆنی (یوسف) هەست دەکەم ﴿لو لا ان تفندون﴾ ئەگەر وەك جاران بە نەزان و کەم عەقڵم دەرنەکەن؟! ونەڵێن هاتەڕان و پەتەڕانە ﴿٩٥ قالوا تالله إنك لفی ضلالك القدیم﴾ کەچی وتیان سوێند بەخوا! ئێستاش هەر لەسەر هەڵە کۆنەکەی خۆتی، ڕێزی (یوسف)ت لەئێمە لا پترترە! ئەگینا ئەم (یوسف)ـە بۆ نەبرایەوە؟! ﴿٩٦ فلما ان جاء البشیر﴾ ئینجا کاتێ کاروان نزیك بوویەوەو موژدە دەرەکە هات ﴿القاه علی وجهه﴾ کراسەکەی خستە سەر ڕوومەتی یەعقوب ﴿فارتد بصیرا﴾ لەناکاو ڕووناکی چاوەکانی بۆ هاتەوەو، چاوی ڕۆشن بوویەوە ﴿قال الم اقل لکم﴾ یەعقوب بەکوڕەکانی گوت: ئەی من پێم نەوتن ﴿إنی اعلم من الله ما لا تعلمون﴾ کەمن لەلایەن خواوە هەندێ شتی وا ئەزانم ئێوە نایزانن ﴿٩٧ قالوا یاأبانا استغفر لنا ذنوبنا﴾ کوڕەکان وتیان: بابە! کەوابوو لەپەروەرێنت بخوازە کە: هەڵەو گوناهەکانمان بپۆشێت ﴿إنا کنا خاطئین﴾ بەراستیی ئێمە لارو گوناهکار بووین ﴿٩٨ قال سوف استغفر لکم ربی﴾ یەعقوب وتی: لەکاتێکی لەباردا لای پەروەردگارم داوای لێبوردنتان بۆ دەکەم، هەندێ لەزاناکان دەڵێن: پاڕانەوەکەی خستە بەرەبەیان، چونکە کاتی گیرابوونی پاڕەو لاڵەیە ﴿إنه هو الغفور الرحیم﴾ چونکە هەر خۆیەتی لێبوردەو میهرەبان و دڵاوا.

**یووسف پێشوازی لە باوك و دایکی دەکا لە میسر:**

﴿٩٩ فلما دخلوا علی یوسف﴾ ئینجا لە میسر کاتێ چوونە لای یوسف ﴿آوی إلیه ابویه﴾ باوك و دایکیی لەباوەشگرت و، لە کاروانەکە جیایکردنەوەو بردنیە لای خۆی، شیاوی ئاماژە بۆکردنە کاتێ یوسف چوویە پێشوازییەکە، پاشاو تەواوی دەست وپێیانیان ئامادەی ئەو پێشوازییە بوون ﴿وقال ادخلوا مصر إن شاء الله آمنین﴾ وتی: دەسا فەرموون: وەرنە (میسر)ـەوە ئینشەڵڵا لەئاسایش و ئاسوودەدا دەبن ﴿١٠٠ ورفع ابویه علی العرش﴾ و باوك و دایکیی لەسەر تەختی حوکمڕانییەکەی دانا ﴿وخروا له سجدا﴾ ئەوانیش هەموو (دایك وبابیی و، یازدە براکەی) کڕنووشی ڕێزو حورمەتیان بۆ یوسف برد، بەڵێ.. هەر لە(ئادەم)ـەوە، هەتا هاتنی (عیسا) کاتێ کە بچووك سڵاوی لە گەورە کردبا، بۆی ڕەوا بووە سوژدەی ڕێزی بۆ ببات، بەڵام لەم شەریعەتەی دواییەدا، ئەوکارە سڕایەوەو، بڕیاردرا کەتەنها بۆخوا کڕنووش ببرێت ﴿وقال یابت هذا تأویل رؤیای من قبل﴾ و یوسف وتی: بابە! ئەمە مانای ئەوخەوەم بوو لەپێشەوە دیتم، مەبەستی ئەوخەونەیەتی کەدیتی یازدە ئەستێرەو مانگ و خۆر کڕنووشیان بۆ دەبرد ﴿قد جعلها ربی حقا﴾ وا ئێستا پەروەردگارم ئاکامەکەی هێنایە دیی و بەراستی گێڕا، واتە: گەیشتمە ئەو پلەوپایە دیتت ﴿و قد احسن بی إذ اخرجنی من السجن﴾ چونکە ئەو دەمەی لەزیندان دەری هێنام، چاکەی دەربارە کردم. لێرەدا یوسف قۆناغی ئێش و ئازاری ناو بیرەکە وەبیر ناهێنێت، بۆ ئەوە براکانی شەرمەزار نەبن ﴿وجاء بکم

الجزء الثالث عشر — سورة يوسف

فَلَمَّآ أَن جَآءَ ٱلْبَشِيرُ أَلْقَىٰهُ عَلَىٰ وَجْهِهِۦ فَٱرْتَدَّ بَصِيرًا ۖ قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ إِنِّىٓ أَعْلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٩٦﴾ قَالُوا۟ يَـٰٓأَبَانَا ٱسْتَغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَآ إِنَّا كُنَّا خَـٰطِـِٔينَ ﴿٩٧﴾ قَالَ سَوْفَ أَسْتَغْفِرُ لَكُمْ رَبِّىٓ ۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٩٨﴾ فَلَمَّا دَخَلُوا۟ عَلَىٰ يُوسُفَ ءَاوَىٰٓ إِلَيْهِ أَبَوَيْهِ وَقَالَ ٱدْخُلُوا۟ مِصْرَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ ﴿٩٩﴾ وَرَفَعَ أَبَوَيْهِ عَلَى ٱلْعَرْشِ وَخَرُّوا۟ لَهُۥ سُجَّدًا ۖ وَقَالَ يَـٰٓأَبَتِ هَـٰذَا تَأْوِيلُ رُءْيَـٰىَ مِن قَبْلُ قَدْ جَعَلَهَا رَبِّى حَقًّا ۖ وَقَدْ أَحْسَنَ بِىٓ إِذْ أَخْرَجَنِى مِنَ ٱلسِّجْنِ وَجَآءَ بِكُم مِّنَ ٱلْبَدْوِ مِنۢ بَعْدِ أَن نَّزَغَ ٱلشَّيْطَـٰنُ بَيْنِى وَبَيْنَ إِخْوَتِىٓ ۚ إِنَّ رَبِّى لَطِيفٌ لِّمَا يَشَآءُ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١٠٠﴾ ۞ رَبِّ قَدْ ءَاتَيْتَنِى مِنَ ٱلْمُلْكِ وَعَلَّمْتَنِى مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ ۚ فَاطِرَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَنتَ وَلِىِّۦ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ ۖ تَوَفَّنِى مُسْلِمًا وَأَلْحِقْنِى بِٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿١٠١﴾ ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْغَيْبِ نُوحِيهِ إِلَيْكَ ۖ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ أَجْمَعُوٓا۟ أَمْرَهُمْ وَهُمْ يَمْكُرُونَ ﴿١٠٢﴾ وَمَآ أَكْثَرُ ٱلنَّاسِ وَلَوْ حَرَصْتَ بِمُؤْمِنِينَ ﴿١٠٣﴾

الحزب ٢٥

٢٤٧

﴿من البدو﴾ و ئێوەیشی لەو ساراو بیابانەی وڵاتی (کەنعان)ـەوە هێنایە میسر بۆلای من ﴿من بعد أن نزغ الشیطان بینی و بین إخوتی﴾ پاش ئەوەی (شەیتان) نێوانی من و براکانمی تێکدا ﴿إن ربی لطیف لما یشاء﴾ بەراستیی پەروەردگارم بەرامبەر بەهەرکەسێك خۆی حەزبکا، نەرم و خاوەن لوتفە هەرچەندە مەردم دەرك نەکات ﴿إنه هوا لعلیم الحکیم﴾ بەراستیی تەنها خۆی زانیارە، خۆیشی هەمیشە کارجوانە.

## ڕێنماییەکانی ئایەتی (٩٥-١٠٠):

١- هاتنی بۆنی خۆشی یوسف لەمەودایەکی زۆر دوورەوە ئایەت و نیشانەیەکی گەورەیە بۆڕاستیی و پاکیی ئەوبنەماڵە بەرێزە.

٢- گەڕانەوەی نوور و بینایی چاوی یەعقووب، پاش نابینابوونیی ئایەتێکی ترە.

٣- کەرەم و بەخششی یەعقووب و داوای لێبوردن بۆ کوڕەکانی پاش ئەوهەموو ئازارو خەفەتە پێیان چێژا، ئەوپەڕی جوامێریی و شەهامەتە.

٤- پێشوازیی میوان هەر لەدەروازەی شارو گوندەوە پیشەی ئەهلی کەماڵە.

٥- بەراست دەرچوونی خەوەکەی یوسف، چۆنی دیتبوو هاتەدی.

٦- دەرکەوتنی لوتف و ڕەحمەتی فراوانی خوا لەم داستانەدا.

### یووسف دۆعا دەکا لەسەر ئیسلام بمرێ:

**ڕاڤەکارانی قورئان دەڵێن:** یەعقوب بیست و چوار ساڵ لەگەڵ یوسف لە میسردا ژیانی بردەسەر، ئەوجا پێش ئەوە بمرێ وەسیەتی کرد کە لە (شام)دا لە لای (ئیسحاق)ی بابیدا بینێژن، ئەوسا (یوسف)یش پاش مردنی، بردی بۆ شام و لەوێ ئەسپەردەی کرد، لەپاشا (یوسف)یش لەوڵاتی میسردا (٢٣) ساڵ تەمەنی کرد، جا پێش مردنی بەدڵ و بەزمان ڕوودەکاتە خوای گەورەو دەڵێت: ﴿[١٠١] رب قد آتیتنی من الملك﴾ پەروەردگارم! بەڕاستیی تۆ لەم وڵاتەدا دەسەڵات و عیززەت و دونیات پێدام، باوك و دایك و براو کەس وکارمت بۆکۆ کردمەوە ﴿وعلمتنی من تأویل الأحادیث﴾ و لێکدانەوەی خەونەکانیشت فێرکردم ﴿فاطر السموات والأرض﴾ بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەمین ﴿انت ولی فی الدنیا والآخرة﴾ لەدنیاو، لە قیامەتدا هەر ئەتۆی گەورەو سەروەرم ﴿توفنی مسلما والحقنی بالصالحین﴾ دەسا بەموسڵمانی راستەقینە بممرێنەو، بمگەیەنەوە بەپیاوچاکان، واتە: بە پێغەمبەران. بەڵێ.. ئا بەو شێوەیە کۆتایی ژیان و دەسەڵات و دونیای هەموویان هات و گەڕانەوە بۆلای خوای خۆیان. (یوسف) ﷺ لەسەرەمەرگیدا ئەم دۆعایەی دەکرد: (ربی قد آتیتنی..) وە پەیامبەریشمان ﷺ لەسەرەمەرگی خۆیدا دەیفەرموو: (اللهم فی الرفیق الأعلی، اللهم فی الرفیق الأعلی، اللهم فی الرفیق الأعلی) متفق علیە. ﴿[١٠٢] ذلك من أنباء الغیب نوحیه إلیك﴾ داستانی یوسف لێرەدا پێچرایەوەو دوایی هات، بۆیە دەفەرموێ: ئەوداستان و بەسەرهات و هەواڵانە لەم سوورەدا بۆت باسکرا ئەی موحەممەد!ﷺ هەموو لەباس و هەواڵە غەیب و نادیارەکانە، بەوەحیی و بەسروش ئاگادارت دەکەین، واتە: تۆ لەمەو پێش هیچت لێنەدەزانی.

## ڕێنمایەکانی ئایەتی (١٠١):

١- دۆعاو پاڕانەوە بە ئەسماو ناوە جوانەکانی خواو سیفاتە بەرزەکانی.

٢- گەورەیی و فەزڵ شەوق و سۆز بۆلای خواو هاوڕێیەتی صاڵحان و چاکان.

٣- داوای مردن و مەرگ، ئەگەر لەبەر ئێش و ئازار و مەینەتیەکی دونیا نەبێ ڕەوایە، وەکو پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: (لا يتمنين أحدكم الموت لضر نزل به، فإن كان لابد متمنيا فليقل: اللهم أحيني ما كانت الحياة خيرا لي، و توفني إذا كانت الوفاة خيرا لي) رواه مسلم. ﴿وما كنت لديهم إذ أجمعوا أمرهم وهم يمكرون﴾ و ئەگینا کە براکانی یوسف کۆبوونەوە بۆ ئەوەی فێڵێ لەباوکیان بکەن و، یوسف لەگەڵ خۆیان بەرن و بیخەنە بیرەکەوە، تۆ لەوێ ئامادە نەبویت، بەڵکو خۆمان بە وەحیی پێمان گەیاندیت
﴿١٠٣ وما أكثر الناس ولو حرصت بمؤمنين﴾ شیاوی ئاماژە بۆکردنە زۆربەی ئەو مەردمە، هەر چەندە تۆ زۆریش سوور بی و، تێبکۆشی بۆ باوەڕ هێنانیان، ئەوان هەر باوەڕ ناهێنن
﴿١٠٤ وما تسألهم عليه من أجر﴾ و تۆیش ئەی موحەممەد لەبەرامبەر هەوڵەکانتەوە داوای هیچ پاداشێکیان لێناکەیت، هەتا پێیان قورس و نارەحەت بێ و، لەبەرئەوە بڕوا نەهێنن ﴿إن هو إلا ذكر للعالمين﴾ ئەم قورئانەیش تەنها پەندو ئامۆژگاریی و، بیرختسنەوەیەکە بۆ سەرجەم ئادەمیی و پەری.

### مەردم لەو نیشانە زۆرانە تێنافکرێن!

﴿١٠٥ وكأين من آية في السموات والأرض﴾ زۆر ئایەت و نیشانە هەیە لەئاسمانەکان و زەوییدا لەسەر بوون و دەسەڵاتی پەروەردگارو ئیمانی پێبهێنن، کەچی ئەوان ﴿يمرون عليها﴾ بەسەریاندا تێدەپەڕن و ﴿وهم عنها معرضون﴾ ڕوویان لێ وەردەچەرخێنن و لێیان ڕانامێنن!
﴿١٠٦ وما يؤمن أكثرهم بالله إلا وهم مشركون﴾ و خۆ بەشی زۆری ئەو خەڵکەش کە باوەڕ دێنێت، هەرموشریک وبتپەرستە! چاك دەزانن کەخوا دروستکەری بوونەوەرە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا بتەکانیش دەپەرستن! (ئیبن عەبباس) دەڵێ: لەکاتی سووڕانەوەی دەوری کەعبەدا موشریکەکان ئەیان وت: (لبيك لا شريك لك، إلا شريكا هو لك، تملكه وما ملك).
﴿١٠٧ افأمنوا أن تأتيهم غاشية من عذاب الله﴾ ئایا ئەو موشریکانە ئەمینن لەلایەن خواوە جەزرەبەو سزایەکی داگیرکەریان بۆ نایە، هەموویان بگرێتەوەو بەجارێ گشت قڕبێن؟ ﴿أو تأتيهم الساعة بغتة﴾ یان ناترسن کتوپڕ قیامەتیان بۆ بێت ﴿وهم لا يشعرون﴾ و هەر بەخۆیشیان نەزانن؟ جا ئەوکاتە چیدەکەن ؟

### ڕێگەی پێغەمبەر بناسە:

﴿١٠٨ قل هذه سبيلي﴾ ئەی موحەممەد! ﷺ بەو خەڵکە بڵێ: ئەمەیە ڕێگەی من ﴿أدعوا إلى الله على بصيرة انا ومن اتبعني﴾ خۆم و ئەوەی شوێنم کەوتوون خەڵکی بانگ دەکەین بۆ یەکتاپەرستی لەسەر بنچینەی چاوساغی و بەڵگەی شەرعیی و عەقڵی ﴿وسبحان الله وما انا من المشركين﴾ هەمیشەیش خوا لەهەر کەم وکورتیی و ناتەواوییەك بدرێتە پاڵی، بێخەوش ڕادەگرم و، من لەوانەیش نیم شەریك و هاوەڵی بۆ بڕیار دەدەن!

الجزء الثالث عشر — سورة يوسف

وَمَا تَسْـَٔلُهُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠٤﴾ وَكَأَيِّن مِّنْ ءَايَةٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ ﴿١٠٥﴾ وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُم بِٱللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشْرِكُونَ ﴿١٠٦﴾ أَفَأَمِنُوٓا۟ أَن تَأْتِيَهُمْ غَٰشِيَةٌ مِّنْ عَذَابِ ٱللَّهِ أَوْ تَأْتِيَهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿١٠٧﴾ قُلْ هَٰذِهِۦ سَبِيلِىٓ أَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِى وَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٠٨﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ إِلَّا رِجَالًا نُّوحِىٓ إِلَيْهِم مِّنْ أَهْلِ ٱلْقُرَىٰٓ أَفَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَدَارُ ٱلْءَاخِرَةِ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٠٩﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا ٱسْتَيْـَٔسَ ٱلرُّسُلُ وَظَنُّوٓا۟ أَنَّهُمْ قَدْ كُذِبُوا۟ جَآءَهُمْ نَصْرُنَا فَنُجِّىَ مَن نَّشَآءُ وَلَا يُرَدُّ بَأْسُنَا عَنِ ٱلْقَوْمِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿١١٠﴾ لَقَدْ كَانَ فِى قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَىٰ وَلَٰكِن تَصْدِيقَ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ كُلِّ شَىْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿١١١﴾

سورة الرعد ٢٤٨

**هەر لەشارەکان پیاوان بوونەتە پێغەمبەر:**

﴿١٠٩ وما أرسلنا من قبلك إلا رجالا﴾ ئێمە لەپێش هەڵبژاردنی تۆ ئەی موحەممەد!ﷺ هەر لەپیاوان پێغەمبەرانمان ناردووە، واتە: هەرگیز نە لەفریشتە، نە لەئافرەت، نە لەجننیی پێغەمبەرمان نەناردووە، (ئەبوو موسای ئەشعەریی) دەڵێت: لەریزی ژناندا پێغەمبەر نەبووە، بەڵکو بەرزترین پلەو پایەیان نازناوی (صدیقە)ـەیە، وەکو خوای گەورە لەباسی خاتوو (مەریەم)دا دەفەرموێ: (..وأمه صديقة كانا يأكلان الطعام..). ﴿نوحي إليهم﴾ جائەو پیاوانەش وەحیی و سروشمان بۆ ناردوون ﴿من اهل القرى﴾ لەخەڵکی شارەکان بوون، نەك لەخەڵکانی دەشتەکی و نەزان و دڵرەق و، دوور لەئاوەدانیی و شارستانیەت، وەکو (ئیبن کەسیر) و (قورتوبیی) لە تەفسیرەکەیاندا دەڵێن. ﴿افلم يسيروا في الأرض فينظروا﴾ ئەوە بۆ ئەو موشریکانە نەچوون بەرووی زەوییدا گەشتێ بکەن، تا ببینن؟ ﴿كيف كان عاقبة الذين من قبلهم﴾ پاشە رۆژو ئەنجامی ئەو کەسانە لەپێشیانەوە بوون و، وەکو ئەمان بڕوایان نەهێنا چۆن بوو؟ ﴿ولدار الآخرة خير للذين اتقوا﴾ و بێگومانبن ماڵی دوا رۆژی بەهەشت، بۆئەوانەی وا پارێزدەکەن و، تەنها شوێنی بەرنامەکەی خوا دەکەون، چاکترە لەم دنیای ئێستەیان ﴿افلا تعقلون﴾ دەسا بۆچی ئاوەز ناگرن؟

**پاش نائومێدی، یارمەتی دێت بۆ پێغەمبەران:**

﴿١١٠ حتى إذا استيئس الرسل﴾ هیچ نەتەوەو ئوممەتێکمان سزا نەداوە، هەتا ئەودەمە کە پەیامبەرەکانیان لەئیمان هێنانیان مەئیوس و بێ هیوا بووبن ﴿وظنوا انهم قد كذبوا﴾ و یەقینیشیان بووبێ کە لەلایەن نەتەوەکەیانەوە بەدرۆ دەخرێنەوەو باوەڕیان پێناکرێ ﴿جاءهم نصرنا﴾ لەوکاتەدا یارمەتی ئێمەیان بۆهاتووە ﴿فنجي من نشاء﴾ جا کێشمان بویستبا سزای نەدەین، رزگاری دەبوو ﴿ولا يرد بأسنا عن القوم المجرمين﴾ بێگومان سزاو جەزرەبەی ئێمە لەگەڵ تاوانبار قەت رەتناکرێتەوە.

**خاوەن ئاوەز لەم داستانە پەند وەردەگرێ:**

﴿١١١ لقد كان في قصصهم عبرة لأولي الألباب﴾ سوێند بەخوا لەداستان و سەرگوزەشتەی یوسف و براکانیدا، گەلێ عیبرەت و ئامۆژگاریی مەزن هەیە، بۆ خەڵکانی هۆشمەندو ژیر کە بیکەنە رێ نیشاندەری خۆیان، بۆ دۆزینەوەی هەق و راستیی ﴿ماكان حديثا يفترى﴾ دیارە کتێبێکی وەکو ئەم قورئانەش، هەرگیز ناشێ قسەوباسێکی هەڵبەستراو بێت، وەکو ئەوخوا نەناسانە وابیردەکەنەوە! ﴿ولكن تصديق الذي بين يديه﴾ بەڵکو تەصدیقە بۆکتێبە پێشووەکانی بەرلەخۆی ﴿وتفصيل كل شئ﴾ و شیکەرەوەی هەموو شتێکیشە، بەتەواوی بەیانی حەڵاڵ و حەرامی تێدایە ﴿وهدى ورحمة لقوم يؤمنون﴾ و رێ نیشاندان و، رەحمەت و میهرەبانی خوایە بۆخەڵکی بیەوێ باوەڕ بهێنێ.

بێ ئەژمار سوپاس بۆ خوای کارزان و کاربەجێ، لەبەرامبەر ئەو یارمەتییەی پێی بەخشیم بۆ تەواوکردنی تەفسیری سوورەتی (یوسف)، سڵاوی خوای لەسەربێ.

*** *** ***

## ١٣- سوورەتی (الرعد)ـە

## مەدەنییەو (٤٣) ئایەتە

### بەناوی خوای بەبەزەیی و میهرەبان

ئـەم سـوورەتە مەسـەلەکانی یەکخواپەرسـتیی و، پەیامەکـەی پێغەمبـەرو، زیندووبوونـەوەو، پاداشـت و تۆڵـە دەچەسپێنێ، وە چەندین بەڵگەی زیندوو دێنێتـەوە بۆ سـەلماندنی بوونی خـواو، تاك و تـەنیایی ئەو لـە: ئاسمان، زەویی، خۆر، مانگ، شـەو، ڕۆژ، دانەوێڵـەو بـەروبووم.. هتـد. ئینجا بۆ چەسپاندنی زینـدوو بوونـەوە.. دیسـانەوە نموونەیـەك بۆهـەق وناهـەق باسدەکات بەوشێوە قورئانییە کەتـەنها لـە دەسـتی ئەودێت بـەو هـەموو ڕەوانبێژییـەوە ڕاستییەکان بـەیان بکـات. لەکۆتاییـدا وەسفی بـەختیاران و بەدبـەختان دەکـات و، وێنـەی کوێرو بینایـان بۆ دێنێتـەوە.. کۆتاییشـی بـە گەواهیـدانی خـوای گـەورە بـۆ پەیامبـەرێتی پەیامبەر دێت شایەدی بۆ دەدا، کە یەکێکە لە پەیامبەرانی خوای گەورە: (یقول الذین کفروا لست مرسلا قل کفى بالله شهیدا بینی وبینکم ومن عنده علم الکتاب). **وتەیەکی ناسك:** هەندێ لە زانایانی تەفسیر، ئایەتی (ننقصه من أطرافها) کە لـەم سـوورەتەدایە بـەمردنی زانـاو فەقیهـەکانیان تەفسـیر کردۆتـەوە، واتـە: بـە مردنـی چـاکان و صـاڵحان وزانایـان مـەودای زەویـی کـەم دەکـاو تەسـك دەبێتـەوە.. شـاعیرانیش بۆئەمە چەند جوانیان وتووە؟:

الأرض تحیا إذا ما عاش عالمها
متى یمت عالم منه یمت طرف
کالأرض تحیا إذا ما الغیث حل بها
وإن أبى عاد فی أکنافها التلف

**قورئان فەرموودەی خوایە :**

الجزء الثالث عشر — سورة الرعد

سُورَةُ الرَّعْدِ — ترتيبها ١٣ — آياتها ٤٣

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓمٓرۚ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِۗ وَٱلَّذِىٓ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ٱلْحَقُّ
وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِى رَفَعَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيْرِ
عَمَدٍ تَرَوْنَهَاۖ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِۖ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَۖ كُلٌّ
يَجْرِى لِأَجَلٍ مُّسَمًّىۚ يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ يُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّكُم بِلِقَآءِ
رَبِّكُمْ تُوقِنُونَ ﴿٢﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى مَدَّ ٱلْأَرْضَ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِىَ
وَأَنْهَٰرًاۖ وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ جَعَلَ فِيهَا زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِۖ يُغْشِى ٱلَّيْلَ
ٱلنَّهَارَۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٣﴾ وَفِى ٱلْأَرْضِ
قِطَعٌ مُّتَجَٰوِرَٰتٌ وَجَنَّٰتٌ مِّنْ أَعْنَٰبٍ وَزَرْعٌ وَنَخِيلٌ صِنْوَانٌ
وَغَيْرُ صِنْوَانٍ يُسْقَىٰ بِمَآءٍ وَٰحِدٍ وَنُفَضِّلُ بَعْضَهَا عَلَىٰ بَعْضٍ
فِى ٱلْأُكُلِۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٤﴾
۞ وَإِن تَعْجَبْ فَعَجَبٌ قَوْلُهُمْ أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبًا أَءِنَّا لَفِى خَلْقٍ
جَدِيدٍۗ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِرَبِّهِمْۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلْأَغْلَٰلُ
فِىٓ أَعْنَاقِهِمْۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٥﴾

٢٤٩

﴿بسم الله الرحمن الرحیم * [1] المر﴾ ئەم پیتانە ئاماژەو هێمان بۆ پێکهاتەی ئەم قورئانە لەوجۆرە پیتانە، کەچی کەسیش ناتوانێ تـەنها سـوورەتێك وەك ئـەو بێنـێ! ﴿تلك آیات الکتاب﴾ ئەمانە هەر ئایەتەکانی ئەو قورئانەن کەبۆمان ناردووی ، ﴿و الذی أنزل إلیك من ربك الحق﴾ و ئـەوەی کـە لەلایـەن پەروەردگارتـەوە بـۆت نێـردراوە ئـەی مەحەممـەد!ﷺ هەرئـەوە ڕاسـت و ڕەوایـە ﴿ولکـن اکثـر النـاس لایؤمنـون﴾ بـەڵام زۆربـەی خـەڵکی بڕوا نـاهێنن، لەجێگایـەکی تـرەدا دەفـەرموێ: (ومـا أکثـر النـاس ولـو حرصـت بمؤمنین).

### توانایی بێ وێنەی خواو چوونە سەر عەرشی:

﴿[2] الله الذی رفع السموات بغیر عمد ترونها﴾ هـەر ئـەو خوایـە ئـەو کتێبـەی بۆ تـۆ نـاردووە کـە نـاوی (الله)یـەو خاوەن توانایەکی وایە ئاسمانەکانی بەرز ڕاگرتووە، بێ ئەوە هیچ کۆڵەکەو پایەیەکی بۆ دانابێت، ئێوە ببیـنن ﴿ثم

﴿استوى على العرش﴾ پاشانیش بەو شێوەیە خۆی دەیەوێ چووە سەر عەرشی پاشایەتی خۆی، وەك زاناكان لەتەفسیرەكەیدا دەڵێن: (ای علا فوق العرش علوا یلیق بجلاله من غیر تجسیم ولا تكییف ولا تعطیل). (بەندەش) پێم چاكە بێ هیچ لێكدانەوەو لێكۆڵینەوەیەك لەبەرامبەر (ئەسماو سیفاتی) خواوە ملكەچبین و، لەوە بەولاوە سنوور نەشكێنین (وقد فسر أئمة السنة أمثال أبي العالیة ومجاهد وغیرهم أن المقصود ب (استوی) هنا هو العلو والإرتفاع، ولا یذكر عن سواهم غیر ذلك. وقد سئل الإمام مالك عن الإستواء فقال: الإستواء معلوم، والكیف مجهول، والإیمان به واجب، والسؤال عنه بدعة. فالله عزوجل فوق عرشه مستو علیه بالكیفیة التی لا یعلمها إلا هو سبحانه وتعالى. وقد أخبرنا الله ﷻ عن استوائه على عرشه، ولم یخبرنا عن كیفیة وكُنْه ذلك الإستواء، فالكیفیة هنا لایعلمها إلا الله وحده، أما الإستواء فمعلوم عنه أنه العلو والإرتفاع فوق العرش فنحن نؤمن باستوائه إستیواء یلیق بجلاله وعظمته من غیر أن نمثل إستواءه -سبحانه وتعالى- كاستواء أحد من خلقه، تعالى الله عن ذلك علوا كبیرا. والآیات القرآنیة والأحادیث النبویة جاءت صریحة بإثبات صفة الإستواء لله ﷻ. ولا یجوز صرفها أو تحریفها إلى غیر ظاهرها بل نجریها على ظاهرها، فظاهرها مراد، ولا نعطلها أو نمثلها بصفات أحد من خلقه. فأهل السنة بین التعطیل والتمثیل. فهم لا ینفون صفات الله التي وصف بها نفسه ولا یمثلون صفاته بصفات خلقه، فالله نفى عن نفسه المثل وأثبت الصفة. نقلنا هذا عن كتاب: صفات الله ﷻ للأستاذ صالح علي المسند). (حافیزی حەكەمیی)ش (هەزار رەحمەت لەگۆڕی) لەم هۆنراوانەدا چەندە جوان دەڵێت:

وكل ماله من الصفات * * * أثبتها في محكم الأیات
أوصح فیما قاله الرسول * * * فحقه التسلیم والقبول
نمرها صریحة كما أتت * * * مع اعتقادنا لماله اقتضت
من غیر تشبیه ولا تعطیل * * * و غیر تكییف و لاتمثیل
بل قولنا قول أئمة الهدى * * * طوبى لمن بهدیه قد اهتدى

هەروەها ئەم باسە لەسوورەتی (ئەعراف)یشدا بە درێژتر لێرە باسكراوە، دەتوانی بگەڕێیتەوە ئەوێ ﴿وسخر الشمس والقمر﴾ و خۆرو (هەیڤ)یشی رام كرد ﴿كل یجری لأجل مسمى﴾ و هەردووكیشیان تائەوكاتەی بۆیان دیارییكراوە كەكاتی تیاچوونی ئەم دونیایە لەخولگەی خۆیاندا هەر دێن و دەچن و خزمەتی مرۆڤ دەكەن، وەكو لەسوورەتی(یس)یشدا دەفەرموێ: (والشمس تجری لمستقر لها..) ﴿یدبر الأمر﴾ زۆر بەوردیی كاروباری ئەم بوونەوەرە، هەڵدەسووڕێنێ و بەڕێوە دەبا ﴿یفصل الآیات﴾ ئایەت و نیشانەكانی گەورەیی و دەسەڵاتی خۆی لەم بوونەوەرەدا شیتەڵ و شیی دەكاتەوە، هەتا ئێوە بیانكەنە بەڵگەی بوون و گەورەیی ئەو ﴿لعلكم بلقاء ربكم توقنون﴾ و بەشكو بەگەیشتنی دیداری پەروەردگاریشتان بگەنە یەقین.

**نیشانەكانی توانایی خوا لەسەر زەوییدا:**

﴿٣ وهو الذی مد الأرض﴾ خوا هەر ئەو زاتەیە كە زەویی بەهەموو بارێكا راكێشاوەو فراوان رایخستووە بۆتان، بەشێوەیەك كەبەكەڵكی ژیان بێت ﴿وجعل فیها رواسی وانهارا﴾ و چەند شاخ و كێوێكی تیا دامەزراندووە تازەویی پێدامركێت و، لەرەلەر نەكات، ئێوەیش بتوانن بەسەریەوە بژیین، وەهەروەها چەند رووبارێكی رەوانیشی تێدا بەدیهێناوە، هەتا بۆ سوودو قازانجی خۆتان بەكاریان بێنن ﴿ومن كل الثمرات جعل فیها زوجین اثنین﴾ وە لەهەموو جۆری میوەكاندا دوو جووتی تیادروستكردووە، ترش و شیرین، رەش و سپیی، گەورەو بچووك، وەیان بڵێین:

نێرومێی بەدیهێناوە بۆ متوربە کردنی یەکتر بۆ ئێوە ﴿یغشی اللیل النهار﴾ و بەتاریکی شەو، ڕۆژ دادەپۆشێ ﴿إن فی ذلك لآیات لقوم یتفکرون﴾ بێگومان لەو گش ئاڵ و گۆڕانەدا چەندین ئایەت و نیشانەی گەورەو مەزن هەیە لەسەر بوون و تاك وتەنیایی، دەسەڵاتی بێ سنووری خوا بۆ گەلێك ڕادەمێنن و بیردەکەنەوەو کوێرانە بەسەر ئەم بوونەوەردا ناچن ﴿٤ وفی الأرض قطع متجاورات﴾ وە لەزەوییشدا چەندین پارچە زەویی لەپاڵ یەکدا هەن و، جیان و لێکیش ناچن ئەم پارچەی دەشت و نەرمانەو، ئەو پارچەشی ڕەقانە، ئەگەرچی گڵەکەشی یەك جۆربێ، کەچی بڕێکی بەکەڵکی کشت و مەزرا دێت، بڕێکیشی بێسوودو خێرە ﴿وجنات من أعناب﴾ وە هەروەها چەندین باخات لەجۆراو جۆری ڕەزە ترێ هەن کە هەرکام تام و ڕەنگێکیان هەیە، بەدیهێنا بۆتان ﴿وزرع ونخیل صنوان وغیر صنوان﴾ و چەندین کشت و زارو، دارخورمای لفدارو بێ لف و لێکجودا هەن ﴿یسقی بماء واحد﴾ ئەوانە هەموو بەیەك جۆر ئاو دەدرێن و، لە ناو یەك جۆر گڵدان ﴿ونفضل بعضها علی بعض فی الأکل﴾ و فەزڵ و ڕێزی هەندێکیان بەسەر هەندێکی تریاندا لەخواردن و تام و چێژدا دەدەین، وەکو مرۆڤ هەموو لەنەوەی (ئادەم)ـن، کەچی لێکجیان، ئەوەیان ئاکاری باش وچاکە، ئەوەیان لاسارو خراپە.! وەیان ڕەنگ و ڕوخساریان هەمەڕەنگە ﴿إن فی ذلك لآیات لقوم یعقلون﴾ بەراستیی ئالەو شتانەدا باسکران گەلێ بەڵگەو نیشانە هەیە بۆئەوانەی کەبەوردیی بیردەکەنەوە لەدەسەڵات و توانایی خوای گەورەو، ئاوەزی خۆیان دەخەنەگەڕ.

**نکووڵی ژیانەوە ( دوای مردن ) سەیرە !**

﴿٥ و إن تعجب فَعَجَبٌ قولهم﴾ خۆ ئەگەر تۆ لەوە کەئەو بتپەرستانە بڕوات پێناکەن و، ڕۆژی دواییش بەدرۆ دەزانن، سەرسام دەبیت، چاکبزانە وتەکەی ئەوانە سەیرە کە دەڵێن: ﴿إإذا کنا ترابا﴾ ئاخۆ کەئێمە مردین و بووینە گڵ ﴿إنـا لفی خلق جدیـد﴾ سەر لەنوێ ساز دەکرێینەوە؟ لەجێگایەکی تردا خوای گەورە بۆ بیرکردنەوە لەدروستبوونی ئاسمانەکان و زەویی و، پاشان باوەڕکردن بەزیندووبوونەوەو ناساندنی توانایی خۆی دەفەرموێ: (أولم یروا أن الله الذی خلق السموات والأرض ولم یعی بخلقهن بقادر علی أن یحیی الموتی بلی إنه علی کل شیء قدیر) سوورەتی ٤٦/٣٣ ﴿أولئك الذین کفروا بربهم﴾ ئا ئەمانەن کافر بوون بەپەروەردگاری خۆیان، بۆیە وا نکووڵی زیندوو بوونەوەیان دەکرد ﴿وأولئك الأغلال فی أعناقهم﴾ و هەر ئەمانەشن لەڕۆژی قیامەتدا کۆت و زنجیر لە گەردنیاندایە ﴿وأولئك أصحاب النار﴾ و ئەمانەن هاوڕێ و یاری ئاگری دۆزەخ ﴿هم فیها خالدون﴾ بۆ هەمیشەش لەوێ دەمێننەوەو، قەتیس دەبن و، ڕۆژێ لێی کلا نابن.

**خوا نەناس هەمیشە بە هەڵپەو بە پەلەیە:**

﴿٦ و یستعجلونك بالسیئة قبل الحسنة﴾ و هەر لەبەر سەختگیرییان بۆ بەدرۆ خستنەوەی تۆ، پێش چاکە: (بێوەیی و عافیەت)، پەلەت لێ دەکەن بەدابەزینی سزا بۆسەریان ﴿وقد خلت من قبلهم المثلات﴾ خۆ بەر لەوانیش خەڵکێکی زۆر تووشی سزاو تۆڵەی پەندهێنەر بوون لەگەلانی سەرکەشی ڕابوردو کەهەق بوو پەندو عیبرەت وەرگرن لێیانەوە ﴿وإن ربك لذو مغفرة للناس علی ظلمهم﴾ وخۆ لەڕاستییدا پەروەردگارت خاوەن لێبوردنێکی ئێجگار گەورەیە بۆخەڵکی، ئەگەرچی ئەوان ستەمکاریش بن، ئەوەتا لەگەڵ خراپکارییاندا لەدنیا تۆڵەیان نادات، چونکە ئەگەر خوا بەتاوان خەڵك بگرێ، هیچ دەعبایەك لەسەرپشتی زەویی دەرناچێ، وەکو لەم ئایەتەدا دەفەرموێ: (ولو یؤاخذ الناس بما کسبوا ماترك علی ظهرها من دابة..) ﴿وإن ربك لشدید العقاب﴾ و خۆ بێگومان پەروەردگاری تۆ

تۆڵەی توندو سەختە، بۆئەوانەی تەوبە ناکەن و ناگەڕێنەوە و، پێ لەسەر کوفری خۆیان و بەدبەختیی خۆیان دادەگرن.

**موشریکان داوای بەڵگەی تر دەکەن:**

﴿[٧] ویقول الذین کفروا﴾ خوانەناس و بێ باوەڕەکانیش بەعینادیی ئێرەیی خۆیان دەڵێن: ﴿لولا انزل علیه آیة من ربه﴾ ئەوە بۆچی لەلایەن پەروەردگاریەوە بەڵگەیەکی پتەوو بەهێز نەنێردرایە سەر موحەممەد، تاماشای راستیی ئەو بکەینێ، هەر وەکو پێش ئەو گەلێ بەڵگەو موعجیزە بۆ موساو، عیسا هات ؟! بەڵێ.. ئەو موشریکانە بەردەوام رەخنەی بێ جێیان لە پێغەمبەر دەگرت، جارێ دەیانگوت: ئەر پێغەمبەرە با(صەفا) بکاتە زێڕ، بائەو چیایە لەبن بێنێ و، بیکاتە مێرگ وروبار بۆمان! ﴿إنما انت منذر﴾ خوا لەوەڵامیاندا فەرمووی: تۆ هەرتەنها ترسێنەرێکی، ئیتر دەسەڵاتی ئەوجۆرە شتانەت پێنەسپێراوە، ئەوانیش هەر دەیانەوێ بروبیانو بگرن و، لاساریت لەگەڵ بکەن! ﴿ولکل قوم هاد﴾ و بۆ هەر گەلێك لەگەلانی دنیا ڕێ نیشاندەرێك هەبووەو، بانگیان دەکات بۆ ڕێی خوا، هەر وەکو تۆ بانگی هۆزەکەت دەکەیت بۆ لای خوا، ئیتر لەتێگەیاندو تەبلیغات بەولاوە هیچ پێغەمبەرێك شتێکیدیی بەدەست نەبووە ﴿[٨] الله یعلم ما تحمل کل انثی﴾ لە پزدان و هەموو مێینەیەکدا (ژن، ئاژەڵ) هەرچی تێدابێ پێش دیاریدانی نێرومێ خوا دەیزانێ و، تەنها هەرئەویش ئاگادارە پێی، ئاخۆ: نێرینەیە، یامێینە، جەستەی تەواوە، یان ناتەواوە؟، جوانە، یان نا؟ وەکو لەسوورەتێکی تردا دەفەرموێ:(ویعلم مافی الأرحام..) ﴿وما تغیض الأرحام﴾ وە هەرئەویش دەزانێ کە منداڵدانەکان چییان لێکەم دەبێتەوە، واتە: لەباریان دەچێ ﴿وما تزداد﴾ وە یان پتر لەماوەی ئاسایی خۆیان دەزێن، ژنی واهەیە پاش دەمانگ، یان زیاتر ئەوجا (حەمل)ـەکەی دادەنێت، دەئەمانە گشت لای خوا زانراوە، وەکو پێغەمبەر دەفەرموێ: ((مفاتیح الغیب خمس، لایعلمهن إلا الله..)). ﴿وکل شئ عنده بمقدار﴾ شیاوی باسە هەموو شتێکیش بەلای خواوە ئەندازەیەکی دیارییکراوی هەیە، ماوەی لە دایکبوونی بە ئاسایی، یان بە نائاسایی، رزق و ڕۆزیی، ئاکام و مەرگیی، بەختیاریی و بەدبەختیی.

الجزء الثالث عشر — سورة الرعد

وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِالسَّيِّئَةِ قَبْلَ الْحَسَنَةِ وَقَدْ خَلَتْ مِن
قَبْلِهِمُ الْمَثُلَاتُ وَإِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ لِّلنَّاسِ عَلَىٰ ظُلْمِهِمْ
وَإِنَّ رَبَّكَ لَشَدِيدُ الْعِقَابِ ﴿٦﴾ وَيَقُولُ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْلَا
أُنزِلَ عَلَيْهِ آيَةٌ مِّن رَّبِّهِ إِنَّمَا أَنتَ مُنذِرٌ وَلِكُلِّ قَوْمٍ هَادٍ
﴿٧﴾ اللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَحْمِلُ كُلُّ أُنثَىٰ وَمَا تَغِيضُ الْأَرْحَامُ
وَمَا تَزْدَادُ وَكُلُّ شَيْءٍ عِندَهُ بِمِقْدَارٍ ﴿٨﴾ عَالِمُ الْغَيْبِ
وَالشَّهَادَةِ الْكَبِيرُ الْمُتَعَالِ ﴿٩﴾ سَوَاءٌ مِّنكُم مَّنْ أَسَرَّ
الْقَوْلَ وَمَن جَهَرَ بِهِ وَمَنْ هُوَ مُسْتَخْفٍ بِاللَّيْلِ وَسَارِبٌ
بِالنَّهَارِ ﴿١٠﴾ لَهُ مُعَقِّبَاتٌ مِّن بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ يَحْفَظُونَهُ
مِنْ أَمْرِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا مَا بِأَنفُسِهِمْ
وَإِذَا أَرَادَ اللَّهُ بِقَوْمٍ سُوءًا فَلَا مَرَدَّ لَهُ وَمَا لَهُم مِّن دُونِهِ مِن
وَالٍ ﴿١١﴾ هُوَ الَّذِي يُرِيكُمُ الْبَرْقَ خَوْفًا وَطَمَعًا
وَيُنشِئُ السَّحَابَ الثِّقَالَ ﴿١٢﴾ وَيُسَبِّحُ الرَّعْدُ بِحَمْدِهِ
وَالْمَلَائِكَةُ مِنْ خِيفَتِهِ وَيُرْسِلُ الصَّوَاعِقَ فَيُصِيبُ بِهَا
مَن يَشَاءُ وَهُمْ يُجَادِلُونَ فِي اللَّهِ وَهُوَ شَدِيدُ الْمِحَالِ ﴿١٣﴾

٢٥٠ — لَهُ دَعْوَةُ

**هەر خوا ئاگای لە دیارو نادیارە:**

﴿[٩] عالم الغیب والشهادة﴾ ئەو زاتەیە بەگشت نادیارو دیارێك زاناو ئاگادارە ﴿الکبیر المتعال﴾ و ئەویشە گەورە، لە هەموو شتێك، هەرئەویشە بەرزو بڵند بەسەر گشت شتێکدا ﴿[١٠] سواء منکم من أسر القول ومن جهر به﴾ لەزانینی خوادا یەکسانە ئەو کەسەتان بەپەنامەکیی و نهێنیی قسە بکات، ئەوەشتان ئاشکرا بیکاو دەنگ هەڵبڕێت، واتە: هەرکارێکی خێر یان شەڕبکات، لەهەر حاڵەتێکدا بێت، لای خوا چوونیەکەو پێیدەزانێت، هەر ئەمەیشە خاتوو

(عائیشه) دەڵێت: ئەو دەمە کەخاتوو (خەولە)هات لەوەزعی خۆی سکالاَّ بکات، من لە تەنیشتی ئەومالَّەدا بووم، کەچی ئاگاشم لەگەڵی لەوقسەو باسانە نەبوو، کەچی خوا فەرمووی: (قدسمع الله قول التی تجادلك فی زوجها وتشتكي إلى الله والله يسمع تحاوركما والله سميع عليم) سوورەتی/ موجادەلـه. ﴿ومن هو مُستخْف بالیل﴾ و ئەوکەسەش کەبەشەودا خۆی دەشارێتەوە ﴿وسارب بالنهار﴾ و ئەو کەسەیش کەبەڕۆژی نیوەڕۆدا دێت و دەچێت، واتە: هەرکەسێك لەئێوە چ بە ڕووناکیی و، چ بە تاریکیی کارەکانی خۆی ئەنجام بدا، خوا هەر ئاگادارەو پێیدەزانێ ﴿[11] له معقبات من بين يديه من خلفه يحفظونه من امرالله﴾ ئەو(خوا)یە کۆمەڵێك فریشتەی هەیە کەیەك لە دوای یەك دێـن، لەپێشیەوەو لەپشتیەوە ئامادەن و پارێزگاریی دەکەن بەفەرمانی خوا. (موجاهید) دەڵێ: هەمووکەسێك فریشتەیەکی بۆ دیارییکراوە بۆ پاراستنی بەفەرمانی خوا لەهەر شتێك کە بیەوێ ئازارو ئەزیەتی پێبگەیەنێ، چ خەوتبێ، چ بەخەبەر بێ، لەمەیشدا جنی و ئادەمیی یەکسانە. (بوخاریی) و (موسلیم)یش ئەم فەرمودەیان لەم بارەیەوە هێناوەکە دەفەرموێ: ((یتعاقبون فیکم ملائکة باللیل وملائکة بالنهار، فیجتمعون فی صلاة الفجر و فی صلاة العصر))، مەبەست ئەوەیە کە فریشتە بەشەوو بەڕۆژ یەك بەدوای یەکدا بەردەوام دا دەبەزن بۆپاراستنی مرۆڤ و، بۆ نووسینی کاروکردەوەی و، بۆئەوەیش لەکاتی نوێژی بەیانی و، عەسراندا کۆدەبنەوەو بەیەك دەگەن و، بەردەوام هەرلەچاودێرییدان ﴿إن الله لا يغير ما بقوم﴾ بێگومان خوا چارەنووس و نازو نیعمەتی خۆی لەهەر هۆزو نەتەوەیەك ناگۆڕێ و، لێیان تێکنادات ﴿حتى يغيروا ما بأنفسهم﴾ تاکو ئەوان دڵ و دەروونی خۆیان نەگۆڕن بەرەو باری لارو خراپ، جا ئەوکاتە خوایش ژیانیان لێ تێکدەدات، بۆنمونە: بڕواداران لەجەنگی (ئوحود)دا سەرپێچیان لەفەرمانی پێغەمبەر ﷺ کرد، جا بۆ دوایی ئەوانیش ئەوەیان ئەوقەبوو کە ئەوقەیانبوو! ئەگەرچی هەمووشیان سەرپێچیان نەکرد، لەفەرموودەدا هاتووە: (..وقد سُئل أنُهلك وفينا الصالحون؟ ((قال: نعم إذا كثر الخبث)) بوخاریی. واتە: پرسیاریان کرد ئایا ئێمە لەناو دەبرێین پیاوچاکانیشمان لەناودا هەبێت؟ پێغەمبەریش فەرمووی: بەڵێ.. هەرکە گوناح و تاوان زۆربوو تەڕوو وشك پێکەوە دەسووتێ و تیادەچێت ﴿وإذا أرادالله بقوم سوءاً فلا مرد له﴾ خۆ هەرکات خوا ویستی زیان و نارەحەتییەك بەسەر هۆزێکدا بهێنێ، هەرگیز گەڕانەوەی بۆنیە ﴿وما لهم من دونه من وال﴾ بێجگە لەخۆیشی هیچ پشتیوان و سەرپەرشتی کارێکیان بۆنیە، تابتوانێ ئەوسزاو نارەحەتییەیان لێدوور بخاتەوە.

**هەورە بروسکە نیشانەی دەسەلاَّتی خوان:**

﴿[12] هو الذی یریکم البرق﴾ هەر ئەو زاتەیە کە: بەرق و برووسکەتان لە نێو هەورەکاندا نیشان دەدات ﴿خوفا وطعما﴾ لەلایەکەوە دەبێتە مایەی ترس، لەلایەکی دیکەوە دەبێتە هۆی هیواو ئومێدی باران، پەیامبەر ﷺ هەرکە گرمە گرمی هەوری دەبیست، دەیفەرموو: ((اللهم لا تقتلنا بغضبك، ولا تهلكنا بعذابك، وعافنا قبل ذلك)) رواه الترمذی، والنسائی، والحاكم ، وأحمد، والبخاری فی الأدب. واتە: خوایە! بەتووڕەیی و غەزەبی خۆت نەمانکوژیت و بەسزای خۆت قڕمان نەکەیت و، بەر لەوانە چاو پۆشیمان لێبکە ﴿وينشئ السحاب الثقال﴾ هەر ئەویشە هەورە قورس و پڕبارانەکان بەدی دێنێ ﴿[13] و يسبح الرعد بحمده﴾ و هەر ئەویشە کەهەورە گرمە بەستایشکردنی تەسبیحات و یادی دەکا ﴿و الملائكة من خيفته﴾ و فریشتەکانیش لەبەر ترس و بیمی دەسەلاَّتی بێسنووری ئەو، بەبەردەوامی یادی دەکەن ﴿ويرسل الصواعق﴾ و هەر ئەویشە کەهەورە تریشقەکان دەنێرێ بۆسەر زەویی ﴿فيصيب بها من يشاء﴾ ئینجا ویستی لە هەرکەسێکی بداو لەناوی بەرێت، ئەوا زۆر بەئاسانی پێی دووچار دەکاو

دەیفەوتێنێ ﴿وهم یجادلون فی الله﴾ لەگەڵ ئەوهەموو بەڵگەو نیشانانەیشدا، هێشتای ئەوانە هەرخەریکی دەمەقاڵێ و موجادەلەن لەبارەی خواوەوە! ﴿وهو شدید المحال﴾ و ئەو زاتە بۆخۆی توندگیرە.

**بتەکان بە دەنگ کەسەوە نایەن:**

﴿[١٤] له دعوة الحق﴾ بانگەوازی هەق و راستەقینە تەنها هی ئەوە، واتە: وشەی خودا بەیەکزانین هەر بۆئەوە، دەسا ئێوەش هەر ئەو بپەرستن و، بەتەنها هاوار لەوبکەن ﴿والذین یدعون من دونه﴾ نموونەی ئەوانەی کەبەدەر لەخوا دەپەرستن و، هاوارو هانای بۆ دەبەن ﴿لایستجیبون لهم بشئ﴾ وەڵامی هیچ شتێکیان نادەنەوەو، بەدەنگیانەوە نایەن ﴿إلا کباسط کفیه إلی الماء﴾ وەکو کەسێك کە لە کەناری بیرێکدا هەردوو دەستی درێژکا بۆناو بیرەکە ﴿لیبلغ فاه﴾ تا بەڵکو ئاو بگاتە دەمیی ﴿وما هو ببالغه﴾ خۆ دیارە بەوشێوەیە هەرگیز ئاوناگاتە دەمیی و، سوودمەند نابێت، چونکە وا لەوێ دەستی نایگاتێ، دەسا ئیتر دەمی چۆن دەیگاتێ وتینوویەتی دەشکێت؟ واتە: چەندە ئەو کەسە کەڵك لەو ئاوە وەردەگرێ و تینوویەتی دەشکێ، بت پەرستەکانیش ئەوەندە لەبتەکانیان بەهرەمەند دەبن ﴿وما دعاء الکافرین إلا فی ضلال﴾ بێگومان دۆعاو پەرستنی کافران و بێ باوەڕانیش هەر گومڕایی و سەر لێشێواوییەو قەت سوود لە پەرستراوەکانیان وەر ناگرن!

الجزء الثالث عشر — سورة الرعد

لَهُۥ دَعْوَةُ ٱلْحَقِّ وَٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَسْتَجِيبُونَ لَهُم بِشَىْءٍ إِلَّا كَبَٰسِطِ كَفَّيْهِ إِلَى ٱلْمَآءِ لِيَبْلُغَ فَاهُ وَمَا هُوَ بِبَٰلِغِهِۦ ۚ وَمَا دُعَآءُ ٱلْكَٰفِرِينَ إِلَّا فِى ضَلَٰلٍ ﴿١٤﴾ وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَظِلَٰلُهُم بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْءَاصَالِ ۩ ﴿١٥﴾ قُلْ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ قُلِ ٱللَّهُ ۚ قُلْ أَفَٱتَّخَذْتُم مِّن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ لَا يَمْلِكُونَ لِأَنفُسِهِمْ نَفْعًا وَلَا ضَرًّا ۚ قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ أَمْ هَلْ تَسْتَوِى ٱلظُّلُمَٰتُ وَٱلنُّورُ ۗ أَمْ جَعَلُوا۟ لِلَّهِ شُرَكَآءَ خَلَقُوا۟ كَخَلْقِهِۦ فَتَشَٰبَهَ ٱلْخَلْقُ عَلَيْهِمْ ۚ قُلِ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَىْءٍ وَهُوَ ٱلْوَٰحِدُ ٱلْقَهَّٰرُ ﴿١٦﴾ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَسَالَتْ أَوْدِيَةٌۢ بِقَدَرِهَا فَٱحْتَمَلَ ٱلسَّيْلُ زَبَدًا رَّابِيًا ۚ وَمِمَّا يُوقِدُونَ عَلَيْهِ فِى ٱلنَّارِ ٱبْتِغَآءَ حِلْيَةٍ أَوْ مَتَٰعٍ زَبَدٌ مِّثْلُهُۥ ۚ كَذَٰلِكَ يَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْحَقَّ وَٱلْبَٰطِلَ ۚ فَأَمَّا ٱلزَّبَدُ فَيَذْهَبُ جُفَآءً ۖ وَأَمَّا مَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ فَيَمْكُثُ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ كَذَٰلِكَ يَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَالَ ﴿١٧﴾ لِلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِرَبِّهِمُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ وَٱلَّذِينَ لَمْ يَسْتَجِيبُوا۟ لَهُۥ لَوْ أَنَّ لَهُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُۥ مَعَهُۥ لَٱفْتَدَوْا۟ بِهِۦٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ سُوٓءُ ٱلْحِسَابِ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴿١٨﴾

سجدة

٢٥١

**بوونەوەر سەرجەم سوژدە بۆ خوا دەبا:**

﴿[١٥] ولله یسجد من فی السموات والأرض طوعا وکرها وظلالهم بالغدو والآصال﴾ وە هەموو ئەوانەی کە لە ئاسمانەکان و زەویدان، تەنانەتی سێبەرەکانیشیان، بیانەوێ و نەیانەوێ بە بەیانیان و ئێواران، سەرجەم ئەمانە گشتیان سوجدە بۆخوا دەبەن، واتە: خوای گەورە رژێم و یاسایەکی بۆداناون، هەرگیز ناتوانن لێی لابدەن و لاساری بکەن، لەجێگایەکی تردا دەفەرموێ: (أولم یروا إلی ماخلق الله من شيء یتفیؤا ظلاله عن الیمین و الشمائل سجداً لله وهم داخرون) ٤٨/١٦.

**بەڵگەی تاك و تەنیایی خوا:**

﴿[١٦] قل من رب السموات والأرض﴾ ئەی موحەممەدﷺ بڵێ پێیان: کێیە بەدیهێنەرو خاوەنی ئاسمانەکان و زەویی؟ ﴿قل الله﴾ دیارە ئەوان هیچ وەڵامێکیان نییە و ناتوانن نەڵێن خوایە، هەر خۆیشت بڵێ: (الله) خوایە بەدیهێنەرو خاوەنیان، چونکە کەسێکی تر نییە بێجگە لەو شیاوی ئەوە بێ و، بتوانێ ئەوکارە ئەنجام بدات ﴿قل افاتخذتم من دونه أولیاء﴾ بڵێ: ئایا! زیاتر لەوخوایە رەوایە چەند پشتیوان و پەرستراوێکتان هەڵبژاردووەو کردووتانن بەخوای خۆتان ﴿لایملکون لأنفسهم نفعا ولا ضرا﴾ کە تەنانەتی بۆخۆیشیان دەسەڵاتی هیچ سوودو زیانێکیان نییە ﴿قل هل یستوی الأعمی والبصیر﴾ بڵێ ئاخۆ بیناو نابینا یەکسانن؟ واتە: مرۆڤی خاوەن باوەڕو،

بێ باوەڕ چوونیەکن؟﴿أم هل تستوی الظلمات والنور﴾ یاخۆ تاریکاییەکان و ڕووناکیی وەك یەکن؟ واتە: کوفرو شیرك ونەزانی و ئیمان و باوەڕ وەك یەکن؟﴿أم جعلوا لله شرکاء﴾ یا ئەوانە چەند هاوبەشێکیان بۆ خوا داناوە ﴿خلقوا کخلقه﴾ کە وەکو دروستکراوی ئەو (خوا)یەیان دروست کردبێ ﴿فتشابه الخلق علیهم﴾ ئەوجا ئەو دروستکردنە لەوانی شێواندبێ و، چەواشە بووبن و، ئیتر دوای ئەوە پەرستبنیان؟! ﴿قل الله خالق کل شئ﴾ بڵێ: ئەی موحەممەدﷺ تەنها هەر (الله) خوایە دروستکەری هەموو شتێك، نەك ئەو بتانە ئەوان دەیانپەرستن ﴿وهو الواحد القهار﴾ وە ئەویش تاك وتەنیای دەسەڵاتدارە، بە سەرهەموو شتێکدا.

**دوو نموونە بۆ مانەوەی هەق و تیاچوونی ناهەق:**

﴿١٧ أنزل من السماء ماء﴾ ئەو (خوایە)یە لە ئاسمانەوە ئاوو بارانێکی باراند ﴿فسالت أودیة بقدرها﴾ ئینجا هەر شیوودۆڵێکی پڕاوپڕو بارستایی خۆی باران کردو لافاوی لێپەیدا بوو ﴿فاحتمل السیل زبدا رابیا﴾ ئەوجا ئەو سێڵاوو لافاوە، پووش و پەڵاش و کەفێکی زۆری لەگەڵ خۆیدا هەڵگرت و لێی جیا بووەوەو، ئاوەکەش بەڕوونی دەرکەوت، ئەمە وێنەو نموونەی ڕەوا (هەق)و ناڕەوا (باطل)ـە، ئاوەکە نموونەی هەق و ڕاستییە کە بەپاکیی پاش کەف و کەفەڵۆکەکە ئەمێنێتەوە، کەفەکەیش نموونەی دین و بەرنامەی باتڵ و ناڕەواو ناهەقە، بۆیە پاش ماوەیەك دەبینی بۆ خۆی فش و پووچەڵ دەبێتەوە. ﴿ومما یوقدون علیه فی النار﴾ وە هەروا نمونەو مەسەلێکی دیکە دێنێتەوە بەو کانزانەی (وەکو زێڕو زیوو ئاسن ومس) کە لەسەر ئاگر دەتوێنرێنەوە ﴿ابتغاء حلیة أو متاع زبد مثله﴾ بە مەبەستی پاڵاوتن و وەدەست هێنانی کەرەستەی جوان و خشڵێك، یان بەمەبەستی دروست کردنی هەرشتێکی تر کەدەبێتە هۆی ژیان و ژیوار، دیارە ئەمیش هەر وەکو ئاوەکە کەف و کەفەڵۆك دەکەوێتە سەرێی و، زۆر بەبێ بەهاو بێ نرخ تەماشا دەکرێت ﴿کذلك یضرب الله الحق والباطل﴾ بەو شێوەیە خوا مەسەل و نموونە بۆهەق وباطل دێنێتەوەو لێکیان جیادەکاتەوە، دیارە هەق و ڕەواکە، کەدینی ئیسلامی پیرۆزە، وەکو ئەو ئاوە ساف و پاك و بێگەردە، لەسەر زەوییدا بەساف و پاکی ئەمێنێتەوەو، خەڵك سوودی لێ وەردەگرێ، یان بڵێین دینی ئیسلام وەکو ئەو زێڕە پاڵاوتە کراوە وایە، بەرنامەی ناهەق و باتڵیش وەکو کەفی سەرئاوو، چڵك و چەپەڵی سەر زێڕ وایە، دەبینی زۆر بەزوویی دەنیشێتەوەو گوم دەبێ و دەڕوا، ئەگەرچی ماوەیەکیش تێکەڵ بەیەك ببن، وەك ئەفەرموێ: ﴿فأما الزبد فیذهب جفاء﴾ جا کەفەڵۆکەکە لەناو دەچێ و دەڕواو فڕێدەدرێت ، چونکە هیچ قازانج وخێرێکی تیا نابێت ﴿وأما ما ینفع الناس﴾ بەڵام ئەوەی کە بەهرەو کەڵك بە خەڵك دەگەیەنێت، وەکو ئاوەکە، یان وەکو مەوادی فلزیی و کانزایی ﴿فیمکث فی الأرض﴾ لەزەوییدا دەمێنێتەوەو بەرقەرار دەبێ ﴿کذلك یضرب الله الأمثال﴾ خوا بەوشێوەیە نموونە دێنێتەوە بۆئیمان و باوەڕ، بۆکوفرو بێ بڕوایی، بۆ هیدایەت و، بۆ گومڕایی، جا مەبەست لەونموونانە ئاشکراکردنی جیاوازییە لەنێوان هەق و ناهەق و، ئیمان و کوفردا.

**پاداش و تۆڵەی بەختیارو بەدبەخت:**

﴿١٨ للذین استجابوا لربهم الحسنی﴾ بۆ ئەوانەی وا وەڵامی بانگێشتەکەی پەروەردگاریان دایەوە، لەڕۆژی قیامەتدا پاداشی چاکترو، بەهەشتیان بۆ هەیە ﴿والذین لم یستجیبوا له﴾ و ئەوانەیش کەوەڵامی بانگهێشتەکەیان نەدایەوەو بڕوایان نەهێنا ﴿لو أن لهم مافی الأرض جمیعا﴾ ئەگەر تەواوی ئەوەی لەزەوییدایە هی ئەوان بێت ﴿ومثله معه﴾ و ئەوەندەی تریشی لەگەڵ بێ ﴿لافتدوا به﴾ هەموو بدەن بۆ ڕزگاربوونی خۆیان لەسزاو بیانەوێت خۆیان بکڕنەوە، دەیدەن و هێمای لێیان وەرناگیرێ و ڕزگارنابن ﴿أولئك لهم سوء الحساب﴾ ئەوانە لەڕۆژی دواییدا

حسابێکی سەختیان بۆ هەیە، واتە: کاری وردو درشتیان بۆ دەهێنرێتە پێش چاو، ئەوسا چاکەکانیان لێوەر ناگیرێ، چونکە بۆ خوایان نەکردووە لە خراپەکانیشیان نابووردرێ ﴿ومأواهم جهنم﴾ و جێگایشیان دۆزەخە ﴿وبئس المهاد﴾ ئای چ جێگایەکی خراپە دۆزەخ.

**هەق ناس و حاشا کەر لەهەق یەک نین:**

﴿[١٩] افمن يعلم أنما أنزل إليك من ربك الحق﴾ ئاخۆ کەسێك بڕوای وابێ کە ئەو قورئانە لەلایەن پەروەردگارتەوە بۆت دابەزێنراوەو، هەموویشی بەهەق و ڕاست دەزانێت ﴿كمن هو اعمى﴾ وەکو ئەوکەسە وایە کە لەبارەی قورئانەوە کوت و کوێرو نابینایەو ڕاستییەکان نابینێ و باوەڕیان پێناکات؟ ﴿إنما يتذكر اولوا الألباب﴾ بێگومان تەنها خاوەن بیرو ژیرەکانن تێدەگەن و دەزانن کەئەو قورئانە ڕاستەو لەلایەن خواوە هاتۆتە خوارەوە، ئەگینە لارو لاسارەکان گوێیان لێی نیەو باوەڕیشی پێناکەن.

**پەسنی بەختیاران:**

﴿[٢٠] الذين يوفون بعهدالله﴾ ئەو ژیرانە، ئەوانەن کەپەیمانی خوا جێبەجێ دەکەن و، دەیبەنە سەرو وەفای پێدەکەن ﴿ولا ينقضون الميثاق﴾ و ئەو پەیمانەیش لە(ئەزەل) بە ئەستۆیانەوەیە هەڵیناوەشێننەوەو سەرپێچی و فەرمان شکێنی تێدا ناکەن ﴿[٢١] والذين يصلون ما امر الله به أن يوصل﴾ و ئەوانەن هەرشتێ خوا بڕیاری دابێ کەبگەیەنرێ و جێبەجێ بکرێ، دەیگەیەنن و جێبەجێی دەکەن ﴿ويخشون ربهم﴾ و لە پەروەردگاریشیان دەترسن ﴿ويخافون سوء الحساب﴾ و لە لێکۆڵینەوەو حیسابی دژواری دوا ڕۆژیش هەر دەترسن ﴿[٢٢] والذين صبروا ابتغاء وجه ربهم﴾ و ئەوانەشن کە بۆ بەدەست هێنانی ڕەزایەت و خۆشنوودی پەروەردگاریان لەبەرامبەر هەموو ئێش و ئازارەکانەوە ئارام دەگرن و وەڕس نابن ﴿و اقاموا الصلاة﴾ و بەرێکوپێکی نوێژەکانیان ئەنجام دەدەن ﴿وانفقوا مما رزقناهم سرا وعلانية﴾ و لەو ڕزق و ڕۆزیەی پێمانداون، بەنهێنی و بەئاشکرا لێیدەبەخشن ﴿ويدرؤن بالحسنة السيئة﴾ وە هەمیشە بەکاری چاکە، پاڵ بەخراپەکەیانەوە دەنێن، لەبەرامبەر خراپەو نالەباریی خەڵکەوە هەمیشە پیاوەتی و چاکە دەکەن ﴿اولئك لهم عقبى الدار﴾ پاشە ڕۆژی پیرۆزو چاکی ئەو دونیا، هەر بۆئەمانە ﴿[٢٣] جنات عدن يدخلونها﴾ ئەویش چەند باخ و بەهەشتێکەو، بەئاسوودەیی دەچنە ناویەوەو بە هەمیشەیش هەر لەوێ دەبن ﴿ومن صلح من آبائهم وازواجهم وذرياتهم﴾ و هەروا باوو باپیران و ژنان و منداڵانیشیان، ئەوانەیان کاری چاك و پەسەندیان کردووە، لەبەر ڕێزنان لەمانە بەقەدرو بەحورمەتەوە پێکەوە دەچنە ئەو بەهەشتانەوە ﴿والملائكة يدخلون عليهم من كل باب * [٢٤] سلام عليكم﴾ وە لەهەر دەرگایەکیشەوە فریشتەکان دێنەلایان سەلامیان لێ دەکەن و دەڵێن: سەلامتان لەسەربێت ﴿بما صبرتم﴾ بەهۆی



۞ أَفَمَن يَعْلَمُ أَنَّمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ٱلْحَقُّ كَمَنْ هُوَ أَعْمَىٰٓ ۚ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ
أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩﴾ ٱلَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَلَا يَنقُضُونَ ٱلْمِيثَٰقَ
﴿٢٠﴾ وَٱلَّذِينَ يَصِلُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ
وَيَخَافُونَ سُوٓءَ ٱلْحِسَابِ ﴿٢١﴾ وَٱلَّذِينَ صَبَرُوا۟ ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ رَبِّهِمْ
وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُوا۟ مِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً وَيَدْرَءُونَ
بِٱلْحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عُقْبَى ٱلدَّارِ ﴿٢٢﴾ جَنَّٰتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا
وَمَن صَلَحَ مِنْ ءَابَآئِهِمْ وَأَزْوَٰجِهِمْ وَذُرِّيَّٰتِهِمْ ۖ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَدْخُلُونَ
عَلَيْهِم مِّن كُلِّ بَابٍ ﴿٢٣﴾ سَلَٰمٌ عَلَيْكُم بِمَا صَبَرْتُمْ ۚ فَنِعْمَ عُقْبَى ٱلدَّارِ
﴿٢٤﴾ وَٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهْدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مِيثَٰقِهِۦ وَيَقْطَعُونَ مَآ
أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ ۙ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱللَّعْنَةُ
وَلَهُمْ سُوٓءُ ٱلدَّارِ ﴿٢٥﴾ ٱللَّهُ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ۚ وَفَرِحُوا۟
بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا فِى ٱلْءَاخِرَةِ إِلَّا مَتَٰعٌ ﴿٢٦﴾ وَيَقُولُ
ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ ۗ قُلْ إِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ
مَن يَشَآءُ وَيَهْدِىٓ إِلَيْهِ مَنْ أَنَابَ ﴿٢٧﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَتَطْمَئِنُّ
قُلُوبُهُم بِذِكْرِ ٱللَّهِ ۗ أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴿٢٨﴾

صەبرو خۆگرتنتانەوە لەسەر ئایینی خواو.. ﴿فنعم عقبى الدار﴾ ئای چەند چاك و باشە! سەرەنجامی چاکی ئەودنیا بەوشێوەیە.

**نیشانەی بەد بەختان:**

﴿[٢٥] والذين ينقضون عهد الله من بعد ميثاقه﴾ بەلاَم ئەوانەی کە پەیمانی خۆیان لەگەڵ خوادا، دوای گرێدان و بەستنیی هەڵدەوەشێننەوە ﴿ويقطعون ماامر الله به ان يوصل﴾ و ئەوی کەخوا فەرمانی داوە جێبەجێ بکرێ وەك سیلەی خزمایەتی، ئەوان دەیبڕن و ئەنجامی نادەن ﴿ويفسدون فى الأرض﴾ هێمان لەزەوییشدا فەسادو خراپەکاری دەکەن ﴿اولئك لهم اللعنة ولهم سوء الدار﴾ ئەوانە نەفرین و نەعلەتیان بۆ بڕاوەتەوەو، لەدوا رۆژیشدا پاشەرۆژی خراپیان هەیە ﴿[٢٦] الله يبسط الرزق لمن يشاء ويقدر﴾ بزانن خودا (الله) رزق و رۆزی زۆر دەدا بەهەرکەسێك خۆی بیەوێ، وە دەیگرێتەوە لەوەیش خۆی بیەوێ ﴿و فرحوا بالحياة الدنيا﴾ و کافرو بتپەرستەکان زیاد لەئەندازە بەژیانی ئەم دونیایەیان دڵخۆشن و بایی بوون! ﴿وما الحياة الدنيا فى الآخرة إلامتاع﴾ خۆ ژیانی ئەم دونیایەش لەچاو ژیانی دواڕۆژدا، لەزەت و خۆشییەکی زۆر کورت و کەم دەوامە ﴿[٢٧] ويقول الذين كفروا﴾ و کافرو بێ باوەڕەکانی سەردەم دەڵێن: ﴿لولا انزل عليه آية من ربه﴾ ئەوە بۆ لەلایەن خواوە ئایەت و موعجیزەیەك بۆ موحەممەد نەهاتە خوارێ، تابیبێتە بەڵگە بۆڕاستی خۆیی و دەعواکەی، هەروەکو بۆ موساو عیسا هات؟ ﴿قل إن الله يضل من يشاء﴾ پێیان بڵێ: بەڕاستی خوا ئارەزووی لە هەرکەسێك ببێت کە نەگەڕێتەوە بۆلای گومڕاو لاڕێی دەکا، ئەگەر دوای ناردنی موعجیزەش بووبێت، چونکە بەزۆر ئیمان بەکەس ناهێنێت ﴿ويهدى إليه من اناب﴾ و هەر کەسێکیش بەرەو ئەوبگەڕێتەوەو لەکاری نەشیاوو ناپەسەندیی پەشیمان ببێتەوە، ڕێنمایی دەکا.

**یادی خوا ئۆقرەو ئارامی دڵانە:**

﴿[٢٨] الذين آمنوا وتطمئن قلوبهم بذكر الله﴾ ئەمانەیش دەگەڕێنەوە بۆلای خوا ئەوکەسانەن کە بڕوای چاك وپوختیان هێناوەو، هەر بەئیتاعەو یادی خوایش دڵیان دادەمەزرێ و ئاسوودە دەبێت ﴿الا بذكر الله تطمئن القلوب﴾ جا چاك بزانن! بەیادی خوا دڵەکان ئۆقرە دەگرن و ئاسوودە دەبن، بۆیە باوەڕدارانیش دڵەکانیان هەردەم ئاسوودەو دامەزراوە ﴿[٢٩] الذين آمنوا وعملوا الصالحات﴾ ئەوانەی وا بڕوایان هێناوەو کارە چاکەکانیان ئەنجام داوە ﴿طوبى لهم وحسن مآب﴾ لەپاشە رۆژدا خۆشترین ژیان و، باشترین سەرەنجامیان بۆ هەیە.

**هاتنی پێغەمبەران لەبەرچی؟**

﴿[٣٠] كذلك ارسلناك فى امة قد خلت من قبلها امم﴾ هەر وەکو پەیامبەرانی پێشوومان ناردە لای قەوم و نەتەوەی خۆیان، تۆیشمان ناردە لای ئەوئوممەتە کەبەر لەوان چەندین هۆزو ئوممەتی تربوون و تێپەڕین ﴿لتتلوا عليهم الذى اوحينا إليك﴾ تا ئەم قورئانەی کە بەوەحی بۆمان ناردویت بۆیانی بخوێنیتەوەو، لە سەرلێشێواوی بییانگێڕیتەوە ﴿وهم يكفرون بالرحمن﴾ کەچی ئەوان بەهۆی تاوان و بتپەرستنەوە، نکووڵی پەرستنی خوای بەبەزەیی دەکەن! (ئیبن عەباس) دەڵێ: ئەم ئایەتە لەبارەی قورەیشییەکانەوە هاتەخوارێ، ئەوکاتە کە پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموون: ((اسجدوا للرحمن)) سوژدەو کوڕنوش بەرنە بەرخوای رەحمان و بەبەزەیی، کەچی وتیان: (ومالرحمن؟) ئێمە نازانین رەحمان چییە؟ ﴿قل هو ربى لا إله إلا هو﴾ بڵێ: هەر ئەوخوا بەبەزەیی و میهرەبانەیە، خواو پەروەردگاری منە، جگە لەویش هیچ پەرستراوێکی تر بەهەق نیە ﴿عليه توكلت وإليه متاب﴾ من هەر پشت بەودەبەستم و، هەر بۆلای ئەویش دەگەڕێمەوە.

### گەورەیی قورئان و حاشای خوانەناس لێی:

﴿٣١ ولو ان قرآنا سيرت به الجبال﴾ بێگومانە کە ئەگەر قورئانی واشمان ناردبا کێوەکانی بەجوڵە خرابا لەجێگاکانیان ﴿او قطعت به الأرض﴾ یان زەویی پێ پارەپارە کرابا ﴿او كلم به الموتى﴾ وەیان مردووی بهێنابایە قسەو، لەپێش چاویانەوە زیندووی کردبانەوە، خۆدەکرا وابکەین، بەڵام هێشتای ئێوە ئەی قەومی قورەیش و هاوبیرو باوەڕیان! هەر بڕواتان بەقورئانێکی وایش نەدەکرد! جا ئیتر بۆ دەڵێن: (لولا انزل عليه آية من ربه..)، لەولایشەوە ئەم قورئانە بۆ ئەوجۆرە کارانە نەهاتووە کە بەشێوەی نائاسایی خۆی بنوێنی، هەتا خەڵکی ناچار بکات بە باوەڕهێنان، بەڵکو دەبێ ئەوخەڵکە بە ژیرانە باوەڕ بهێنێت ﴿بل لله الأمر جميعا﴾ بەڵام هەموو کاروبارێک تەنها بۆخوا خۆیەتی لەموعجیزات و پاداشتی حاشاکەراندا ﴿افلم ييأس الذين آمنوا﴾ دە ئایا ئەوانەی باوەڕیان هێناوە، تا ئێستایش بێ هیوا نەبوون لەبڕواهێنانی ئەوکافرو بێ باوەڕانە؟ باچاک بزانن ﴿ان لو يشاء الله لهدى الناس جميعا﴾ کە ئەگەر خوا ویستبای بەزۆر مەردم موسڵمان بکا، بێگومان تەواوی ئادەمیزادی دەخستە سەر ڕێی ڕاست و، سەرجەم ڕێنمایی دەکردن بۆ ڕاستەڕێ، بەڵام ویستی بەو جۆرە نیە کەبەزۆر باوەڕ بەخەڵکیی بهێنێ ﴿و لا يزال الذين كفروا تصيبهم بما صنعوا قارعة﴾ و ئەوانەش کافرو بێ باوەڕبوون، هەروا لەسەرکوفرو بێ باوەڕیەکەیان دەمێننەوەو ئیمان ناهێنن، هەتا بەهۆی کاروکردارە خراپ و نارێکەکانیانەوە، بەڵاو نەهاتێکی سەختیان دووچار دەبێت ﴿او تحل قريبا من دارهم﴾ یان هەر لەپەنای ماڵ و خانووەکانیانەوەو نزیک بەخۆیان، ئەوبەڵایە ڕوویان تێدەکاو دێتە سەریان ﴿حتى يأتي وعد الله﴾ جا ئەمانە بەوحاڵەوە هەردەمێننەوە هەتا بەڵێنی خوا دێ بە فەتحی (مەککە)و، (کابە)یش لەبت و بتپەرستان پاک دەکرێتەوەو، دینی ئیسلام سەر دەکەوێ و زاڵ دەبێت ﴿إن الله لا يخلف الميعاد﴾ بەڕاستیی خوا لە ئەنجامدانی بەڵێنی خۆی دوا ناکەوێت.

الجزء الثالث عشر — سورة الرعد

ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ طُوبَىٰ لَهُمْ وَحُسْنُ
مَـَٔابٖ ﴿٢٩﴾ كَذَٰلِكَ أَرْسَلْنَٰكَ فِيٓ أُمَّةٖ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهَآ أُمَمٞ
لِّتَتْلُوَاْ عَلَيْهِمُ ٱلَّذِيٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ وَهُمْ يَكْفُرُونَ بِٱلرَّحْمَٰنِۚ
قُلْ هُوَ رَبِّي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ مَتَابِ ﴿٣٠﴾
وَلَوْ أَنَّ قُرْءَانٗا سُيِّرَتْ بِهِ ٱلْجِبَالُ أَوْ قُطِّعَتْ بِهِ ٱلْأَرْضُ أَوْ كُلِّمَ
بِهِ ٱلْمَوْتَىٰۗ بَل لِّلَّهِ ٱلْأَمْرُ جَمِيعًاۗ أَفَلَمْ يَاْيْـَٔسِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ
أَن لَّوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَهَدَى ٱلنَّاسَ جَمِيعٗاۗ وَلَا يَزَالُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ
تُصِيبُهُم بِمَا صَنَعُواْ قَارِعَةٌ أَوْ تَحُلُّ قَرِيبٗا مِّن دَارِهِمْ حَتَّىٰ يَأْتِيَ
وَعْدُ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُخْلِفُ ٱلْمِيعَادَ ﴿٣١﴾ وَلَقَدِ ٱسْتُهْزِئَ بِرُسُلٖ
مِّن قَبْلِكَ فَأَمْلَيْتُ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ ثُمَّ أَخَذْتُهُمْۖ فَكَيْفَ كَانَ
عِقَابِ ﴿٣٢﴾ أَفَمَنْ هُوَ قَآئِمٌ عَلَىٰ كُلِّ نَفْسِۢ بِمَا كَسَبَتْۗ وَجَعَلُواْ
لِلَّهِ شُرَكَآءَ قُلْ سَمُّوهُمْۚ أَمْ تُنَبِّـُٔونَهُۥ بِمَا لَا يَعْلَمُ فِي ٱلْأَرْضِ أَم
بِظَٰهِرٖ مِّنَ ٱلْقَوْلِۗ بَلْ زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ مَكْرُهُمْ وَصُدُّواْ عَنِ
ٱلسَّبِيلِۗ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٖ ﴿٣٣﴾ لَّهُمْ عَذَابٞ فِي ٱلْحَيَوٰةِ
ٱلدُّنْيَاۖ وَلَعَذَابُ ٱلْأٓخِرَةِ أَشَقُّۖ وَمَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن وَاقٖ ﴿٣٤﴾

٢٥٣

### دڵدانەوەی پێغەمبەر ﷺ:

﴿٣٢ ولقد استهزئ برسل من قبلك﴾ و بەڕاستیی بەر لە تۆیش ئەی پێغەمبەر گاڵتەو مەسخەرە بەپەیامبەران کراوە، هەروەک هۆزەکەی تۆ گاڵتەو مەسخەرە بەتۆ ئەکەن، بەڵام ئەو پێغەمبەرانە لەبەرامبەر ئەوەوە زۆر مەحکەم خۆیان ڕاگرت و بەصەبر بوون، کەوابوو تۆیش دەبێ ئارامت هەبێ ﴿فأمليت للذين كفروا﴾ ئینجا منیش بۆ ماوەیەک وازم هێنا لەوکەسانەی کافرو بێ باوەڕن و، لێیانگەڕام ﴿ثم أخذتهم﴾ لە پاشا قارم لێگرتن و فەوتانمن ﴿فكيف كان عقاب﴾ جا دیتت چۆن بوو سزاو تۆڵەی من؟ ﴿٣٣ افمن هو قائم على كل نفس بما كسبت﴾ ئایا ئەوزاتەی، چاودێری

کاروکردەوەی هەموانە ، وەك ئەو بتانە وایە کە لەگش شتێ بێ ئاگاو غافلن؟ ﴿وجعلوا لله شرکاء﴾ لەباتی بڕواهێنان، چەند هاوبەشێکیان بۆ خوا داناو، کردنیانە شەریکیی و هاواریان بۆ دەبردن! ﴿قل سموهم﴾ بڵێ: دەسا سیفەتەکانیان باس بکەن، تا دەرکەوێ ئاخۆ بەکەڵکی خوایەتی دێن؟ وەك ئەوان پێیان وایە خوان و هەریەکە ناوێکیان لێناون: (لات، عوززا، مەنات، هوبەل) واتە: کە بێ گیان و بێ هەستن، چۆن دەیانکەنە هاوتای ئەوخوایە کە دەبینێ و دەبیسێ و ئاگای لەهەمووشتێکە؟! ﴿أم تنبئونه بما لا یعلم فی الأرض﴾ یاخۆ ئێوە لەزەوییدا هەواڵی شتێکی پێ دەدەن وادەزانن نایزانێ و ئاگادار نیە پێی؟! ﴿أم بظاهر من القول﴾ یان لەڕاستیدا چاك دەزانن کە ئەوانە شتێکی هیچ و پووچ و بێ ناوەڕۆکن، بەڵام هەر بەقسەی پڕوو پووچ و و بێ ناوەڕۆك کردووتاننە خوا؟ ﴿بل زین للذین کفروا مکرهم﴾ نەخێر، بێگومانە کەخوا هاوبەشی نیە، بەڵکو لەلایەن شەیتانەوە ئەوکاری بتپەرستییە بۆ ئەوبێ بڕواو کافرانە ڕازاوەتەوەو، وێڵ و سەرگەردان بوون ﴿و صدوا عن السبیل﴾ و ڕێگەی ڕاستیان لێگیراو گومڕابوون ﴿ومن یضلل الله فما له من هاد﴾ و هەرکەسێك خوا گومڕای بکا، بەهۆی کەللە ڕەقی خۆیەوە، ئیتر هیچ ڕێ نیشاندەرێکی بۆ نابێ، کەسێکیتر ناتوانێ ئیمانی لاشیرین بکاو، باوەڕی پێ بهێنێت ﴿[34] لهم عذاب فی الحیاة الدنیا﴾ ئینجا ئەو جۆرە کەسانە، هەر لەم ژیانی دونیایەدا سزایەکی سەخت و قورسیان بۆ هەیە ﴿ولعذاب الآخرة اشق﴾ و دیارە سزای دوا ڕۆژیش قورسترو نارەحەت ترە ﴿ومالهم من الله من واق﴾ وە لەبەرامبەر سزای خوایشەوە هیچ پارێزەرێك نیە، تا لەو جەزرەبەو سزای خوایە بیانپارێزێ.

الجزء الثالث عشر — سورة الرعد

مَّثَلُ ٱلۡجَنَّةِ ٱلَّتِي وُعِدَ ٱلۡمُتَّقُونَۖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۖ
أُكُلُهَا دَآئِمٞ وَظِلُّهَاۚ تِلۡكَ عُقۡبَى ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْۖ وَّعُقۡبَى
ٱلۡكَٰفِرِينَ ٱلنَّارُ ٣٥ وَٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَفۡرَحُونَ
بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَۖ وَمِنَ ٱلۡأَحۡزَابِ مَن يُنكِرُ بَعۡضَهُۥۚ قُلۡ إِنَّمَآ أُمِرۡتُ
أَنۡ أَعۡبُدَ ٱللَّهَ وَلَآ أُشۡرِكَ بِهِۦٓۚ إِلَيۡهِ أَدۡعُواْ وَإِلَيۡهِ مَـَٔابِ ٣٦
وَكَذَٰلِكَ أَنزَلۡنَٰهُ حُكۡمًا عَرَبِيّٗاۚ وَلَئِنِ ٱتَّبَعۡتَ أَهۡوَآءَهُم بَعۡدَ مَا
جَآءَكَ مِنَ ٱلۡعِلۡمِ مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِيّٖ وَلَا وَاقٖ ٣٧ وَلَقَدۡ
أَرۡسَلۡنَا رُسُلٗا مِّن قَبۡلِكَ وَجَعَلۡنَا لَهُمۡ أَزۡوَٰجٗا وَذُرِّيَّةٗۚ وَمَا كَانَ
لِرَسُولٍ أَن يَأۡتِيَ بِـَٔايَةٍ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۗ لِكُلِّ أَجَلٖ كِتَابٞ ٣٨
يَمۡحُواْ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ وَيُثۡبِتُۖ وَعِندَهُۥٓ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ ٣٩
وَإِن مَّا نُرِيَنَّكَ بَعۡضَ ٱلَّذِي نَعِدُهُمۡ أَوۡ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِنَّمَا عَلَيۡكَ
ٱلۡبَلَٰغُ وَعَلَيۡنَا ٱلۡحِسَابُ ٤٠ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّا نَأۡتِي ٱلۡأَرۡضَ نَنقُصُهَا
مِنۡ أَطۡرَافِهَاۚ وَٱللَّهُ يَحۡكُمُ لَا مُعَقِّبَ لِحُكۡمِهِۦۚ وَهُوَ سَرِيعُ
ٱلۡحِسَابِ ٤١ وَقَدۡ مَكَرَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ فَلِلَّهِ ٱلۡمَكۡرُ جَمِيعٗاۖ
يَعۡلَمُ مَا تَكۡسِبُ كُلُّ نَفۡسٖۗ وَسَيَعۡلَمُ ٱلۡكُفَّٰرُ لِمَنۡ عُقۡبَى ٱلدَّارِ ٤٢

٢٥٤ — وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ

### تۆڵەی کافران و پاداشی چاکان:

﴿[35] مثل الجنة التی وعد المتقون﴾ وەسف و وێنەی ئەو بەهەشتەی لەلایەن خوای میهرەبانەوە بەخەڵکی ئیمانداری پارێزکار بەڵێن دراوە ﴿تجری من تحتها الأنهار﴾ بەم شێوەیە کە: لەبن درەختەکانیەوە چەندین ڕووبارو چۆمە ئاوی جوان و خاوێن و پاك دەڕوا ﴿اکلها دائم وظلها﴾ میوەجاتی و سێبەرو سەهەندی هەمووکاتیەو، دوایی نایێ و نابڕێتەوە ﴿تلك عقبی الذین اتقوا﴾ ئا ئەم بەهەشتەیە سەرەنجام و پاشەڕۆژی ئیماندارانی خۆپارێزو لەخوا ترسەو ﴿وعقبی الکافرین النار﴾ سەرەنجام و پاشە ڕۆژی خوا نەناس و بێ باوەڕانیش ئاگری دۆزەخە.

### ئەهلی کتێبی ڕاست دڵیان بە قورئان خۆشە:

﴿[36] والذین آتیناهم الکتاب﴾ و ئەوانەیش کتێب و نامەی (تەورات)و (ئینجیل)مان پێداون ﴿یفرحون بما انزل إلیك﴾ بڕێکیان بەوقورئانەی کە بۆ تۆ نێردراوە دڵشادو خوشحاڵ دەبن، بەتایبەتی کەدەبینن ددان دەنێت بەکتێبە ڕاستەکانی ئەواندا، وە ئەوانەش باوەڕدارەکانی جوولەکەو فەلەکان بوون ﴿ومن الأحزاب من ینکر بعضه﴾ و بەڵام

هەندێك لەو دەستەو بەستەی خاوەن نامەو، موشریكانە هەیە نكوڵی بازێكی قورئان دەكەن، چونكە ئەو بازە دان بەراستی هاتنی پێغەمبەردا دەنێ ﴿قل إنما امرت أن اعبدالله﴾ ئەی پێغەمبەر! بڵێ: من فەرمانم پێدراوە كە تەنها (الله) خوا بپەرستم ﴿ولا أشرك به﴾ كەسی لێ نەكەم بەشەریك و، هاوبەش و هاوەڵی بۆ دانەنێم ﴿إليه ادعوا﴾ من هەر ئەو دەپەرستم و هاواریش تەنها بۆ ئەو دەبەم ﴿وإليه مآب﴾ و سەرەنجام و گەڕانەوەیشم هەر بوڵای ئەوە ﴿٣٧
وكذلك انزلناه حكما عربيا﴾ وەكو چۆن كتێبە پێشووەكانم ناردۆتە خوارەوەو، هەریەكەشیان بەزمانی نەتەوەو گەلەكەی خۆی بووە، هەر ئاوایش بەدەستووری خۆمان ئەم قورئانەمان بەزمانی عەرەبی كەزمانی قەومەكەتە ناردۆتە خوارەوە، هەتا گشت حوكم و بڕیارێكت بەو بێ و، خەڵك و گەلانیش پەیڕەوی لێبكەن ﴿ولئن اتبعت اهواءهم﴾ و ئەگەر تۆ ئەی پێغەمبەر! بكەویتە شوێن هەواو ئارەزووی ئەوخاوەن كتێب و بت پەرستانە ﴿بعدما جاءك من العلم﴾ پاش ئەوەی كە زانست و زانیاریت سەبارەت بەیەك خواپەرستیی بۆهات ﴿مالك من الله من ولي ولا واق﴾ ئەوە لەسزا و جەزرەبەی خوا، هیچ یارمەتیدەرو پارێزەرێكت دەست ناكەوێت بتپارێزێت، جا كەواتە هەرگیز دوای ئارەزووی جولەكەو دیان و موشریكان مەكەوە.

**پێغەمبەران ئادەمزاد بوون:**

﴿٣٨ ولقد ارسلنا رسلا من قبلك﴾ و بەڕاستیی پێش تۆش پەیامبەرانمان ناردوون ﴿وجعلنا لهم ازواجا وذرية﴾
هەر وەكو تۆ ڕێگەمان پێدان كەژن و منداڵیشیان هەبێ، جا كەوایە كەی جێگای ڕەخنەیە تۆ خاوەنی ژن و منداڵ بی، وەكو ئەوانە ڕەخنە دەگرن و كردوویانە بەهەرا! ﴿وما كان لرسول ان يأتي بآية إلا بإذن الله﴾ و هیچ پەیامبەرێكی بەر لەتۆیش، بۆی نەبووە لەخۆیەوە موعجیزەیەك بینێ لەسەر داوای هۆزەكەی، مەگەر بەفەرمانی خوا بووبێت ﴿لكل اجل كتاب﴾ بۆ هەموو سەردەم و، بۆ هەمووكارێكی گرنگ و پێویست، بڕیارو نامەیەكی تایبەتی هەیەو لەخواوە نووسراوەو تۆمار كراوە، بەڵام بەهاتنی دینی ئیسلام هەموو بەرنامەكان كۆتاییان هاتووەو، ئیتر جارێكی دی كتێب و بەرنامەیەكی تر پێویست نیەو نایەت.

**لەناودان و هێڵانەوە بەدەس خوایە:**

﴿٣٩ يمحو الله ما يشاء﴾ هەرچی لەو بڕیارە كاتیانەیە كەخوا پێشتر بۆپێغەمبەرانی ناردووە، هەركامێكیانی ویستبێ لای بدا، ئەوا لایداوەو سڕیویەتەوە ﴿ويثبت﴾ و هەرشتێكیشی ویستبێ بیهێڵێتەوە، ئەوا بۆكاتی دیاریكراوی خۆی هێشتوویەتەوەو نەیگۆڕیوە (ئیبن عەبباس) و (موجاهید) دەڵێن: بێجگە لەژیان ومردن، خۆش بەختی و بەدبەختی ئیتر هەر شتێكی تر كەخۆی حەزبكا دەیسڕێتەوە، بەڵام ئەوجۆرە شتانە قەڵەمی ئەزەلی بەسەریاندا تێپەڕییوەو ناسڕێنەوە ﴿و عنده أم الكتاب﴾ وە دایك و سەرچاوەی هەموو كتێبە ئاسمانیەكان و (لوح المحفوظ) لای خوای گەورەیە، كەوابوو هیچ كەسێك بۆی نییە دەسكاری هیچ بڕیارو حوكمێكی خوا بكاو شتێكی تر بخاتە شوێنی.

**پێغەمبەر راگەیانی لەسەرە، حسابیش لە عۆدەی خوایە:**

﴿٤٠ وإما نرينك بعض الذي نعدهم﴾ ئەی پێغەمبەر! یان هەندێ لەو سزادانەی كە بەڵێنمان داوە هەر لەدونیادا كافرانی پێسزا بدەین، نیشانتی دەدەین و دەیبینیت ﴿او نتوفينك﴾ و یان پێش ئەوە پیشانتی بدەین و بەچاوی خۆت ببینی دەتمرێنین ﴿فإنما عليك البلاغ﴾ بەڕاستی تۆ تەنها گەیاندنی بەرنامەو بڕیارەكانی خوات لەسەرە ﴿وعلينا الحساب﴾ ئیتر حیساب و پاداش و تۆڵەیان لەسەر ئێمەیە، كەوابوو تۆ درێژە بەكاری خۆت بدەو مەوەستە

﴿٤١ أولم يروا انا نأتي الأرض ننقصها من أطرافها﴾ ئایا ئەو بێ باوەڕو بتپەرستانە نەیاندی کەچۆن هەمووکات و ڕۆژێ موسڵمانەکان زاڵ دەکەین بەسەریانداو، دەسەڵات و هێزی ئەوان لەزەوییدا کەم دەکەینەوە؟ واتە: ئایا نەیاندی کە هەر ڕۆژەی پارچەیە زەوییان فەتح ئەکرێ و، مەودای دەسەڵاتیان نامێنێت؟ ﴿والله يحكم لا معقب لحكمه﴾ و هەرحوکم و بڕیارێ خوا دەیدا هیچ کەسێك دەسەڵات و توانای نیە ڕێگری بکاو ڕەتی بکاتەوە ﴿وهو سريع الحساب﴾ زۆریش بەپەلە بەحیساب و پرسینەوەی خەڵکدا ڕائەگات ﴿٤٢ وقد مكر الذين من قبلهم﴾ و بەراستیی کافرانی بەر لەمان، پیلان و نەخشەی زۆریان کێشاو، فروفێڵێکی ئێجگار فرەیان کرد دژی پێغەمبەرەکانیان، هەروەکو قورەیش ئێستا بەرامبەر بەتۆ درێغی ناکاو، بەردەوام فرت وفێڵ دەکەن بۆ فەوتاندنت ﴿فلله المكر جميعا﴾ بەڵام هەموو نەخشەو پلانێکی سەرکەوتوو هەر بۆخوایە ﴿يعلم ما تكسب كل نفس﴾ بەکارو کردەوەی هەمووکەسێك ئەزانێ ﴿وسيعلم الكفار لمن عقبى الدار﴾ و ئەو بێ باوەڕانەیش بۆ دوایی ئەزانن کە پاشەڕۆژی باش بۆ کێ دەبێ؟

**خاوەن نامە دەزانن قورئان هی خوایە:**

﴿٤٣ ويقول الذين كفروا لست مرسلا﴾ و ئەوکافرو بێ باوەڕانە دەڵێن: تۆ پێغەمبەرو نێردراوی خوا نیت ! ﴿قل كفى بالله شهيدا بيني وبينكم ومن عنده علم الكتاب﴾ تۆیش پێیان بڵێ: بەسە خواو ئەو کەسانەی کە زانیاریی و زانستی کتێبی (تەورات) و (ئینجیل) یان لایە، شایەت بن لەنێوان من و ئێوەدا، کە پەیامبەرم.

هەمیشە سوپاسی بێ پایان بۆ خوای دەهندەو دلۆڤان کە یارمەتیدام بۆ تەواوکردنی کورتە تەفسرێکی سوورەتی (ڕەعد).

*** *** ***

## ١٤- سوورەی (ئیبراهیم)ـە مەککەییەو (٥٢) ئایەتە

**بەناوی خوای بەخشەری دلۆڤان**

ئەم سوورەتەیش هەرباسی بیروباوەڕو بناغە سەرەکییەکانی دینی ئیسلام دەکات، وەکو: باوەڕ بەخوای گەورە، بە پەیامەکەی پێغەمبەر، ئیمان بەڕۆژی دوایی و، پاداشت و تۆڵەو، حیساب و لێکۆڵینەوە، دەشتوانی بڵێیت: تەوەرەی سوورەتەکە بەگشتیی، باسی پەیامبەرو پەیامەکەیەتیی، چونکە لەم سوورەتەدا زیاتر لەگشت جێگایەك باسی بانگێشەو بانگبەران کراوەو، کاری سەرەکی پەیامبەریش پتر دیاریی دەکات، ڕاڤەی یەکبوونی تەواوی پەیامە ئاسمانییەکان دەکات، ڕایدەگەیەنێت کەپەیامبەران هەموو بۆ مەحکەمکردنی قەڵاو کۆشکی باوەڕ هاتوون، بۆ ناساندنی یەك خوای تاك و تەنیا بە مەردم هاتوون، بۆ جیاکردنەوەی ڕاست و ناراست نێردراون، هاتوون بۆ دەرهێنانی ئادەمزاد لەناو ئەوهەموو پەردە تاریکانەداو، بەرەو نوورو ڕووناکیی دینی ڕاستەقینەی خوای میهرەبان. کەوابوو هەموو پەیامبەران یەك ئامانج و یەك مەبەستیان بووە، ئەگەرچی لە لق و پۆپەکاندا جیاوازییەك بووبێت. هەروەها باسێکی (مووسا)ش ﷺ دەکات کە: چەندە سوور بوو بۆ بانگکردنی نەتەوەکەی بەرەو یەك خواپەرستیی و، چۆنیش پێیدەگوتن کە دەبێ هەردەم سوپاسگوزاریی خوا بکەن، لەگەڵ باسکردنی چەند نموونەیەك لەو گەلانەی بڕوایان بە پەیامبەرەکانیان نەکرد، وەك نەتەوەکەی (نوح و عادو سەموود..) پاشانیش ئەو گفتوگۆو دەمەقاڵێ و مل ملانێیە کە لەنێوان گەلانی پێشوو و پەیامبەرەکانیاندا ڕوویداو، دەرەنجام لەناوبردنی قەومو هۆزەکانیان: (وقال

الذين كفروا لرسلهم لنخرجنكم من أرضنا أو لتعودن فى ملتنا..). دیمەنێکی سەختی ڕۆژی دواییش دێنێت کە: چۆن سەرۆك و پێشەوا تاوانبارەکان و شوێنکەوتووە کزۆڵەکانیان دەکەونە مەنع و لۆمەی یەکتر، ئەو دەڵێت: تۆ وات لێکردم، ئەم دەڵێت: نا" تۆ بۆ خۆت ئارەزووت هەبوو، بۆیە بەدوامدا هاتیت، ئەگینا من هیچ زۆرێکم نەبوو بەسەرتا، پاشانیش هەمووخڕ دەکرێنەوە بۆ ناو ئاگری دۆزەخ، ئەوساش چۆن دەسدەکەنە تف و نەفرین کردن لەیەکتر ، کە هیچ کەڵکیشی نابێ بۆیان. ئەم سوورەتە چەند ئایەتێك دێنێت بۆ نموونەی باوەڕو گومڕایی " ئیمان: تەشبیە دەکات بەدرەختێکی جوان و چاك و پاکەوە، گومڕاییش دەشوبهێنێ بەدارێکی نالەبارو پیسەوە.. کۆتاییشی دێت بەباسێکی ئەنجامی ستەمکاران لەڕۆژی دواییدا. ئەم سورەتە بەسوورەتی (ئیبراهیم) ناسراوە، لەبەر ئەوە کە هەتا دنیا دنیا بێت ، هەواڵو سەر گوزەشتەکانی ئیبراهیم و ﷺ کارە جوامێرو قەشەنگەکانی ئەو هەرشکۆمەند بن.

الجزء الثالث عشر — سورة إبراهيم

وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَسْتَ مُرْسَلًا ۚ قُلْ كَفَىٰ بِٱللَّهِ
شَهِيدًۢا بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ وَمَنْ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلْكِتَٰبِ ﴿٤٣﴾

سُورَةُ إِبْرَاهِيمَ — ترتيبها ١٤ — آياتها ٥٢

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓر ۚ كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ لِتُخْرِجَ ٱلنَّاسَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ
إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذْنِ رَبِّهِمْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ﴿١﴾
ٱللَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ وَوَيْلٌ
لِّلْكَٰفِرِينَ مِنْ عَذَابٍ شَدِيدٍ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يَسْتَحِبُّونَ
ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا عَلَى ٱلْءَاخِرَةِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ
وَيَبْغُونَهَا عِوَجًا ۚ أُوْلَٰٓئِكَ فِى ضَلَٰلٍۭ بَعِيدٍ ﴿٣﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَا
مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوْمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمْ ۖ فَيُضِلُّ ٱللَّهُ
مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ
﴿٤﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَآ أَنْ أَخْرِجْ
قَوْمَكَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ وَذَكِّرْهُم بِأَيَّىٰمِ
ٱللَّهِ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿٥﴾

٢٥٥

**قورئان خەڵکی لەتاریکییەوە بۆ ڕووناکی دەبا:**

﴿بسم الله الرحمن الرحيم * [١] الر﴾ ئەم قورئانە موعجیزەیە هەر لەجۆری ئەم پیتانەی: (ئەلیف، لام، را) پێکهاتووە، جا ئەگەر ئێوەش لێتاندێ و دەتوانن، دەفەرموون بەلای کەمییەوە وێنەی تەنها سوورەتێکی بێنن ﴿كتاب أنزلناه إليك﴾ ئەم قورئانە کتێبێکە ناردمانە خوارەوە بۆت، واتە: دەست هەڵبەستی تۆ نییە، وەکو موشریکەکانی قورەیش ﴿لتخرج الناس من الظلمات إلى النور بإذن ربهم﴾ تاخەڵکی بەفەرمانی پەروەردگاریان لەتاریکاییەکانی کوفرو نەزانی و نەفامی بێنێتە دەر بۆ ڕووناکی و ئیمان و زانست ﴿إلى صراط العزيز الحميد﴾ بۆ ڕێگاو بەرنامەی ئەوخوا بەدەسەڵات و بەتواناو، هەمیشە سوپاسکراوە لەهەردوو جیهانەکەدا ﴿[٢] الله الذى له مافى السموات ومافى الأرض﴾ ئەو خوایەی چی لەئاسمانەکان و زەوییدایە هی ئەوە، وەکو لەجێیەکی تردا فەرمان دەدا بەپێغەمبەر کە بەگشت خەڵکی جیهان بڵێت: (قل يا أيها الناس: إنى رسول الله إليكم جميعا الذى له ملك السموات والأرض) ١٥٨/٧. دیارە هەر لەم ئایەتەدا دەسەڵاتی بێ سنووری خوای گەورە لەئاسمانەکان و زەوییدا ڕادەگەیەنێت ﴿وويل للكافرين من عذاب شديد﴾ واوەیلا بۆ خوانەناس و بێ بڕوایان لەسزایەکی زۆر سەخت ﴿[٣] الذين يستحبون الحياة الدنيا على الآخرة﴾ ئەوانەی کە فەزڵ و ڕێزی ژیانی ئەم دونیایە دەدەن بەسەر ژیان ونیعمەتی پاشەڕۆژداو، لەویان خۆشتر دەوێ و هەر بۆ ئەوکار دەکەن ﴿ويصدون عن سبيل الله﴾ و خەڵکیش لەڕێی خوا دەگێڕنەوەو، ناهێڵن بەئازادیی و سەر بەستانە دینداری خۆیان بکەن ﴿ويبغونها عوجا﴾ و دەشیانەوێ ئەو ڕێگا ڕاستەی خوایە، لارو خێچ و کەم و کورت پیشان بدەن، هەتا لەگەڵ

هەواو ئارەزووی ئەواندا بگونجێت ﴿اولئك فی ضلال بعید﴾ ئەوانە لەگومڕایی و سەرلێشێواویدان و، لەهەقەوە ترازاو و دوورن.

**هەموو پێغەمبەرێك بەر لە ( محمد ) ﷺ بە زمانی گەلەکەی هاتووە:**

﴿٤ وما ارسلنا من رسول إلا بلسان قومه﴾ هەموو پەیامبەرێکمان بەزمانی هۆزو نەتەوەکەی خۆی ناردووە ﴿لیبین لهم﴾ بۆ ئەوەی شەریعەت و بەرنامەکەی خوایان بۆ ڕۆشن بکاتەوەو، بەئاسانی تێیان بگەیەنێ. پێشەوا (ئەحمەد) ئەم فەرموودەیەی هێناوەو دەڵێت: ((لم یبعث الله عزوجل نبیا إلا بلغة قومه)). هەرگیز خوای گەورە پێغەمبەرێکی نەناردووە بەزمانی نەتەوەکەی نەبووبێ ﴿فیضل الله من یشاء﴾ ئینجا هەرکەسێك خۆی حەز بکات لەگومڕایی و سەرلێشێواویی و هەوڵی بۆ بدات، ئەوا خوای گەورەیش بەهۆی ئەو لاسارییەی ئەوەوە، گومڕاو سەرلێشێواوی دەکات ﴿ویهدی من یشاء﴾ وە هەرکەسیش خۆی بیەوێ بەرەو ڕێنمایی و هیدایەت بێت، ئەوا خوایش بەئاسانیی ڕێنمایی بۆ لای دینی ئیسلام دەکاو، سەر فرازی دنیاو قیامەت دەبێت ﴿وهو العزیز الحکیم﴾ چونکە بەتەنها خوا بەدەسەڵات و بەتوانایە بەسەر هەموو شتێکدا، هەر ئەویشە کارجوانو، چاك دەزانێ چی دەکات.

**کورتە باسێکی مووساو نەتەوەکەی:**

﴿٥ ولقد ارسلنا موسی بآیاتنا﴾ بەراستیی (موسا)شمان بەچەند بەڵگەو نیشانەیەکی گرنگەوە ناردو فرمانمان پێدا ﴿ان اخرج قومك من الظلمات إلی النور﴾ کە بچۆ هۆزو نەتەوەکەت لەتاریکاییەکانی کوفرو نەزانی و نەفانی دەربێنە بۆ نوورو روناکی ئیمان و زانست ﴿وذکرهم بأیام الله﴾ و ڕۆژەکانی خواشیان وەبیربێنەوە، واتە: ئەوڕۆژە سەخت و دژوارانەی خودا بەسەر ئوممەتانی پیشوویدا هێنا ﴿إن فی ذلك لآیات لکل صبار شکور﴾ چونکە لە وەبیرهێنانەوەی ئەو ڕۆژانەدا گەلێ ئایەت و نیشانەی گەورە هەیە بۆ هەربەندەیەکی زۆر خۆڕاگرو، زۆر سوپاس گوزار و شوکرانە بژێر، پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: ((إن امر المؤمن کله عجب، لا یقضی الله له قضاء إلا کان خیرا له، إن أصابته ضراء صبر، فکان خیرا لـه، وإن أصـابته سراء شکر فکان خیرا لـه))، مسلم في کتاب الزهد٤/٢٢٩٥. واتە: بێگومان کاروباری مرۆڤی خاوەن باوەڕ، گشتی جێی خۆشحاڵییە، چونکە هەموو بڕیارەکانی خوای گەورە بەقازانجی ئەو تەواو دەبێت، ئەگەر نەخۆشیی و نەهامەتی تووش بوو، ئەو صەبرو ئارامی لەسەر دەگرێ، دیارە دەبێتە قازانج و خێر بۆی، خۆ ئەگەر فەرەح و خۆشییەکی ئەوقە بوو، شوکرانە بژێر دەبێ، هەمیسان هەر قازانجیەتی ﴿٦ وإذ قال موسی لقومه﴾ ئەوکاتەش وەبیر بێنە کە (مووسا) بەهۆزو نەتەوەکەی خۆی وت: ﴿اذکروا نعمة الله علیکم﴾ ئەو نیعمەت و بەخششەی خوا بەسەرتانەوە وەبیربێننەوە ﴿إذ انجاکم من آل فرعون﴾ ئەو دەمە کەئێوەی لەژێر زەبرو زۆرو دەسەڵاتی بنەماڵەی فیرعەون و، دەستەو بەستەکەی ڕزگار کرد ﴿یسومونکم سوء العذاب﴾ ئەوە بوو کە بەخراپترین شێوە سزای پێدەچێشتن ﴿یذبحون ابناءکم﴾ زۆر بەبێ بەزەییانە کوڕانتانیان سەر دەبڕین ﴿ویستحیون نساءکم﴾ کچانیشتانیان بۆ خزمەتکاریی و کارەکەریی خۆیان بەزیندوویی ڕادەگرت و دەهێشتەوە ﴿وفی ذلکم بلاء من ربکم عظیم﴾ و لەو هەموو بەڵاو نەهامەتییەدا تووشتان بوو، تاقیکردنەوەیەکی گەورەی تێدابوو لەلایەن پەروەردگارتانەوە، لەجێگایەکی تردا ئەفەرموێ: (وبلوناهم بالحسنات والسیئات لعلهم یرجعون) ٧/١/ ١٦ ﴿٧ وإذ تأذن ربکم﴾ و ئەو دەمە کەپەروەردگارتان پێتانی ڕاگەیاند (لئن شکرتم لأزیدنکم) کە: ئەگەر لەبەرامبەر نیعمەتەکانمەوە سوپاسگوزاریی بکەن، ئەوا منیش نیعمەت و بەخششی خۆمتان بۆ زیاد دەکەم

﴿ولئن كفرتم﴾ خۆ ئەگەر بێ باوەڕو سپڵەو پێ نەزانبن ﴿إن عذابى لشديد﴾ ئەوا بەڕاستیی جەزرەبەو سزام زۆر توندو سەختە، لەوانەیە ئەو هەموو نیعمەتانەتان لێ وەر گرمەوەو، تۆڵەی تریشتان بدەم، ئەمەیە کە پێغەمبەر دەفەرموێ: ((إن العبد ليحرم الرزق بالذنب يصيبه)) پێشەوا ئەحمەد. واتە: مرۆڤ بە هۆی گوناح و تاوانێکەوە دەیکا، رزقی کەم دەکاو دەبڕدرێ ﴿٨ وقال موسى إن تكفروا انتم ومن فى الآرض جميعا﴾ جا موسایش بە گەلەکەی خۆیگوت: ئەگەر ئێوەو هەموو خەڵکانی ڕووی زەویی، گشت بەجارێ کافرو بێ باوەڕبن بەخوای گەورە، هیچ زیانێکی پێ ناگات ﴿فإن الله لغنى حميد﴾ چونکە بەڕاستیی خوا بۆخۆی زۆر بێ نیازە لەئێوەو لەهەموو بوونەوەر، زۆریش شیاوی تاریف و سوپاسکردنەو، بوونەوەریش هەموو ملکەچی ئەوە، بۆیە لەسوورەتێکی تردا دەفەرموێ: (إن تكفروا فإن الله غنى عنكم ..)، لەفەرموودەیەکی (قودس)یشدا هاتووە: خەڵکینە! ئەگەر ئێوە بەبنیادەم و جنۆکەیشەوە سەرجەم راساڵ و باشبن، چاك بزانن بەوە موڵکی خوا هیچ زیاد ناکا، خۆئەگەر هەمووشتان بەجارێ لاڕێ و لاسار بن، هەمیسان موڵکی خوا بەوە هیچ کەمناکات، ئەگەر هەموویشتان بەیەکجار داخوازیتان هەبێت، خوای گەورە دەتوانێ وەڵامی هەمووتان بداتەوە، لەگەڵ ئەمانە هەمووشدا بەئەندازەی نووکە دەرزییەك زیان بەدەسەڵاتم ناگاو، موڵکم کەمناکات.

**هۆزەکانی بەر لە محمدیش چوون بە گژ پێغەمبەرەکانیاندا:**

﴿٩ الم يأتكم نبأ الذين من قبلكم﴾ مەگەر ئێوە هەواڵ و بەسەرهاتی ئەوانەی بەرلەخۆتانتان نەبیستووە ﴿قوم نوح وعاد وثمود﴾ نەتەوەی (نووح)و، (هوود)ی پێغەمبەری عادو، (صالح)ی هۆزی سەمود ﴿والذين من بعدهم﴾ و ئەوانەش کە لەدوای ئەوانەوە پەیدا بوون و هاتن و تێپەڕین ﴿لايعلمهم إلاالله﴾ کەخوا نەبێ کەس بە ژمارەو ڕشتەیان نازانێ و بەئاگانییە لێیان، دە ئاخۆ ئەوانە گشت چییان بەسەرهات؟ ﴿جاءتهم رسلهم بالبينات﴾ پەیامبەرەکانیان بەچەندین نیشانەو موعجیزەی زۆر ڕوونەوە هاتنەلایان ﴿فردوا ايديهم فى افواههم﴾ کەچی لەبەر خۆ بەزلزانین و، وە لەبەر کینەو رکەبەرایەتی، دەستیان بەدەما گرتن و قسەکانیان پێ بڕیین و، بە شێوەیەکی نامەردانە چوون بەگژیاندا ﴿وقالوا إنا كفرنا بما ارسلتم به﴾ و گوتیان: ئێمە حاشا لەوە دەکەین ئێوەی پێنێردراوەو هێناوتانە ﴿وإنا لفى شك مما تدعوننا إليه مريب﴾ وە بەڕاستی ئەوەی ئێمەی بۆ بانگ دەکەن بڕوای پێبکەین، زۆر لێی بەگومان و دوودڵین.

**موجادەلەی نێوان پێغەمبەران و هۆزەکانیان:**

﴿١٠ قالت رسلهم افى الله شك فاطر السموات والأرض﴾ پەیامبەرەکانیان لەوەڵامی ئەوقسە ناپەسەند و نابەجێیانەیان وتیان: باشە! ئێوە لەخوایەك بەگومانن کەداهێنەرو دروستکەری ئاسمانەکان و زەوییە؟ ﴿يدعوكم

الجزء الثالث عشر — سورة إبراهيم

وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ
إِذْ أَنجَىٰكُم مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ
وَيُذَبِّحُونَ أَبْنَآءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَآءَكُمْ ۚ وَفِى
ذَٰلِكُم بَلَآءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ ٦ وَإِذْ تَأَذَّنَ
رَبُّكُمْ لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ ۖ وَلَئِن كَفَرْتُمْ إِنَّ
عَذَابِى لَشَدِيدٌ ٧ وَقَالَ مُوسَىٰٓ إِن تَكْفُرُوٓا۟ أَنتُمْ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ
جَمِيعًا فَإِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِىٌّ حَمِيدٌ ٨ أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَؤُا۟ ٱلَّذِينَ
مِن قَبْلِكُمْ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ ۛ وَٱلَّذِينَ مِنۢ
بَعْدِهِمْ ۛ لَا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا ٱللَّهُ ۚ جَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ
فَرَدُّوٓا۟ أَيْدِيَهُمْ فِىٓ أَفْوَٰهِهِمْ وَقَالُوٓا۟ إِنَّا كَفَرْنَا بِمَآ أُرْسِلْتُم
بِهِۦ وَإِنَّا لَفِى شَكٍّ مِّمَّا تَدْعُونَنَآ إِلَيْهِ مُرِيبٍ ٩ ۞ قَالَتْ
رُسُلُهُمْ أَفِى ٱللَّهِ شَكٌّ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ يَدْعُوكُمْ
لِيَغْفِرَ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُؤَخِّرَكُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ
مُّسَمًّى ۚ قَالُوٓا۟ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا تُرِيدُونَ أَن تَصُدُّونَا
عَمَّا كَانَ يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَا فَأْتُونَا بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ١٠

الحزب ٢٦

قالت لهم ٢٥٦

﴿ليغفر لكم من ذنوبكم﴾ بانگێشەتان دەکا هەتا لەگوناحەکانتان ببورێت ﴿ويؤخركم إلى أجل مسمى﴾ لەدنیاشدا تا ئاکامێکی دیارییکراوبۆتان بتانهێڵێتەوەو، بەهۆی یاخییبوونتانەوە بەپەلە لەناوتان نەبا و، سزاتان نەدات ﴿قالوا إن أنتم إلا بشر مثلنا﴾ ئەوانیش وتیان: ئەم قسەو باسەتان چییە، خۆ مەگەر ئێوەش هەروەك ئێمە بنیادەم نین؟ ﴿تريدون أن تصدونا عما كان يعبد آباؤنا﴾ دە تانەوێ لەو خوایانەی کە باوو باپیرانمان دەیانپەرستن وەرمان گێڕن ولامان بدەن؟ ﴿فأتونا بسلطان مبين﴾ جا ئەگەر ڕاست ئەکەن ئێوە پێغەمبەرن دەسا فەرموون بەڵگەیەکی ئاشکرامان بۆ بێنن لەسەر چەسپاندن و سەرخستنی داواکەتان ﴿[١١] قالت لهم رسلهم﴾ جا پەیامبەرەکانیان لەوەڵامدا پێیان وتن: ﴿إن نحن إلا بشر مثلكم﴾ بەڵێ ئێمەیش وەك خۆتان وتتان بنیادەمێکین وەکو ئێوە ﴿ولكن الله يمن على من يشاء من عباده﴾ بەڵام ئەوەندە هەیە خوای گەورە حەز بەهەر بەندەیەکی خۆی بکا، کەپلەی پەیامبەرێتی پێببەخشێ، ئەوا دەیداتێ و ئەو خەڵاتەی دەکات ﴿وما كان لنا أن نأتيكم بسلطان إلا بإذن الله﴾ و ئێمەش بۆمان نییەو ناتوانین هیچ نیشانەو بەڵگەیەکتان بۆ بهێنین لەوانەی داوامان لێدەکەن، بەفەرمان و مۆڵەتی خوا نەبێ ﴿وعلى الله فليتوكل المؤمنون﴾ و دەسا باگشت بڕوادارانیش وەکو ئێمە تەنها بەخوا پشت ببەستن ﴿[١٢] وما لنا أن لانتوكل على الله﴾ باشە! دەبێ بۆچی ئێمە پشت بەو خوایە نەبەستین؟ ﴿وقد هدانا سبلنا﴾ کە ئێمەی هەریەکەمانی خستۆتە سەر ڕێگەکەمان، واتە: ئەو ڕێگەیەی کەخوا ڕێنمایی بۆ کردووین ﴿ولنصبرن على ما آذيتمونا﴾ وە دڵنیاشتان دەکەین کە ئێمە لەبەرامبەر ئەوگشت ئازارو عەزیەتەی ئێوەوە بەئارام دەبین و هەرگیز دەست لە کارەکەشمان هەڵناگرین ﴿وعلى الله فليتوكل المتوكلون﴾ وە دووپاتی دەکەینەوە کەدەبێ پشت بەستووەکان بەخوا (تەوەکول) تەنها پشت بەخوا ببەستن، چونکە خوا لەگەڵ ئەهلی تەوەکول و دۆستانی خۆیەتی.. جاکەواتە تۆیش ئەی موحەممەد ﷺ پەیڕەوی لەو پێغەمبەرانە بکەو بەئارامبەو پشتت تەنها بەخوا ببەستە.

الجزء الثالث عشر　　سورة إبراهيم

قَالَتْ لَهُمْ رُسُلُهُمْ إِن نَّحْنُ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ
يَمُنُّ عَلَىٰ مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ ۖ وَمَا كَانَ لَنَا أَن نَّأْتِيَكُم
بِسُلْطَانٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ ۚ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ
(١١) وَمَا لَنَا أَلَّا نَتَوَكَّلَ عَلَى اللَّهِ وَقَدْ هَدَانَا سُبُلَنَا ۚ
وَلَنَصْبِرَنَّ عَلَىٰ مَا آذَيْتُمُونَا ۚ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُتَوَكِّلُونَ
(١٢) وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِرُسُلِهِمْ لَنُخْرِجَنَّكُم مِّنْ
أَرْضِنَا أَوْ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَا ۖ فَأَوْحَىٰ إِلَيْهِمْ رَبُّهُمْ لَنُهْلِكَنَّ
الظَّالِمِينَ (١٣) وَلَنُسْكِنَنَّكُمُ الْأَرْضَ مِن بَعْدِهِمْ ۚ
ذَٰلِكَ لِمَنْ خَافَ مَقَامِي وَخَافَ وَعِيدِ (١٤) وَاسْتَفْتَحُوا
وَخَابَ كُلُّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ (١٥) مِّن وَرَائِهِ جَهَنَّمُ وَيُسْقَىٰ
مِن مَّاءٍ صَدِيدٍ (١٦) يَتَجَرَّعُهُ وَلَا يَكَادُ يُسِيغُهُ
وَيَأْتِيهِ الْمَوْتُ مِن كُلِّ مَكَانٍ وَمَا هُوَ بِمَيِّتٍ ۖ وَمِن
وَرَائِهِ عَذَابٌ غَلِيظٌ (١٧) مَّثَلُ الَّذِينَ كَفَرُوا بِرَبِّهِمْ ۖ
أَعْمَالُهُمْ كَرَمَادٍ اشْتَدَّتْ بِهِ الرِّيحُ فِي يَوْمٍ عَاصِفٍ ۖ لَّا يَقْدِرُونَ
مِمَّا كَسَبُوا عَلَىٰ شَيْءٍ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ الضَّلَالُ الْبَعِيدُ (١٨)

٢٥٧

## خوا نەناسەکان هەڕەشە لە پێغەمبەرەکانیان دەکەن:

﴿[١٣] وقال الذين كفروا لرسلهم﴾ وە ئەوانەی کە کافرو بێ باوەڕبوون بەپەیامبەرەکانی خۆیانیان گوت: ﴿لنخرجنكم من أرضنا﴾ ئەمە سوێندی بێت لەم وڵات و سەر زەوییەماندا دەرتان دەکەین ﴿أو لتعودن في ملتنا﴾ یان دەبێ واز لەودینە بێنن و، بگەڕێنەوە بۆ دین و بیروباوەڕی ئێمە ، دیارە ئەم هەڕەشەو گوشارە ، دابی هەموو خوا نەناس و کافرێکە، بۆیە هۆزەکەی (شوعەیب)یش عليه السلام بەشوعەیبیان گوت: (لنخرجنك ياشعيب والذين آمنوا معك من قريتنا..) ٨٨/٧. وەیان هۆزەکەی لووت دەڵێ: (أخرجوا آل لوط من قريتكم). ﴿فأوحى إليهم ربهم﴾ ئینجا پاش ئەوە

پەروەردگاریان وەحی بۆ کردن و تێگەیاندن ﴿لنهلكن الظالمين﴾ کە بەراستیی دەستەو بەستەی ناهەقیکاران و ستەمکاران لەناودەبەین ﴿[14] و لنسكننكم الأرض من بعدهم﴾ وبێگومانیش لەپاش لەناوبردنی ئەوانە، ئێوە سەردەخەین و لەشوێنەکانیاندا نیشتەجێتان دەکەین، لەجێگایەکی تردا ئەو راستییە دووپات دەکاتەوەو دەفەرموێ: (وإن جندنا لهم الغالبون) ١٧٢/٢٧ ﴿ذلك لمن خاف مقامي وخاف وعيد﴾ دیارە یارمەتیی ئاواو، لەناوبردنی ئەو ستەمکارانە، بۆکەسێك دەکەین کە لەدەسەلات و پایە بەرزیی و مەقامی من و، لە هەڕەشەکانم دەترسێ، واتە: هەرکەسێکی تریش ئابەوشێوەیە لەمەقام و دەسەلاتم شەرم بکاو بترسێت، ئەوامنیش یارمەتی ئەدەم و سەری دەخەم بەسەر دوژمنیدا، پێچەوانەکەیشی مایەی سەر شۆڕیی و دۆزەخە، وەکو دەفەرموێ: (فأما من طغى وآثر الحياة الدنيا فإن الجحيم هي المأوى) ٢٩/٢٧/٧٩. ﴿[15] واستفتحوا﴾ جا پەیامبەرەکان داوایان لەخوا کرد کە بەسەر هۆزەکانیاندا سەریان بخات کاتێ نائومێد بوون لەئیمان هێنانیان ﴿و خاب كل جبار عنيد﴾ ئیتر خوایش سەری خستن و قازانجیان کردو هەموو خەڵکێکی ملهوڕو ستەمکارو نکوڵی کەریی هەق و راستییەکان، نائومێدو زیانمەند بوون ﴿[16] من ورائه جهنم﴾ لەبەر دەمیشیەوە ئاگری دۆزەخە ﴿ويسقى من ماء صديد﴾ و دەبێ لە زرینچکاوو زۆخاویی دۆزەخییەکانیش بخواتەوە ﴿[17] يتجرعه﴾ لەبەر تاڵیی و ناخۆشییەکەی، زۆر بەقێزوو بێزەوە قوم قوم دەیخواتەوە ﴿ولا يكاد يسيغه﴾ و بەئاسانیش بۆی قووت ناچێ ﴿ويأتيه الموت من كل مكان﴾ لە هەمولایەکیشەوە مەرگی بۆ دێت ﴿وما هو بميت﴾ کەچی ناشمرێ تالەو سزایە رزگاری ببێ ﴿ومن ورائه عذاب غليظ﴾ و پاش ئەو هەموو تاڵیی و تفتییەش، سزاو جەزرەبەیەکی زۆر بەژانیش بەدوایەوە دێت.

**نموونەی کاری کافرانیش، لە نموونەی ( خۆڵەمێش ) دەچێت:**

﴿[18] مثل الذين كفروا بربهم أعمالهم كرماد﴾ مەسەل و نمونەی کارو کردەوەی ئەوانەی کە بە پەروەردگاریان کافرو بێ باوەڕن، هەروەکو خۆڵەمێشێکە ﴿اشتدت به الريح في يوم عاصف﴾ کە لەرۆژێکی گەردەلولدا لەبەرامبەر بایەکی توندا بێت و بیبات بە ئاسماندا ﴿لا يقدرون على شئ مما كسبوا﴾ ئەوانیش ناتوانن لە هەوڵەکانیان و لەوەی کردوویانە هیچ شتێك بەدەست بخەنەوە، هەروەك لەرۆژێکی ئاوادا خاوەنی خۆڵەمێشەکە ناتوانێ کەمێك لەو بووڵ و خۆڵەمێشەیە کۆ بکاتەوە ﴿ذلك هو الضلال البعيد﴾ ئەوجۆرە زیانە گەورەیەش لاڕێ و گومراییەکی زۆر دوورە لەرێنمایی خوا. لەگەڵ ئایەتی تردا ئەو ماناو مەبەستە دووپات کراوەتەوە، بۆ نموونە لە جێگایەکدا دەفەرموێ: (وقدمنا إلى ماعملوا فجعلناه هباء منثورا) وە لەجێگایەکی تریشدا دەفەرموێ: (مثل ماينفقون في هذه الحياة الدنيا كمثل ريح فيها صر أصابت حرث قوم ظلموا أنفسهم فأهلكته..).

**ئەزموونی ئاسمان و زەمین بەڵگەی زیندو بوونەوەیە:**

﴿[19] ألم تران الله خلق السموات والأرض بالحق﴾ ئایا نەتدیت ئەی ئادەمزاد! کەبێگومان خوا ﷻ ئەوگشت ئاسمان و زەوییەی بەهەق و بەراست دروستکردووە؟ ﴿إن يشأ يذهبكم﴾ ئەگەر بیەوێ لەناوتان ببات لەناوتان دەبا ﴿ويأت بخلق جديد﴾ و خەڵکێکی تازەو نوێ دێنێتە شوێنەکەتان ﴿[20] وما ذلك على الله بعزيز﴾ و ئەو کارەش بۆ خوا زەحمەت و قورس نییە، دەباشە خوایەکی بەتوانای ئاوا ناتوانێ ئێوە زیندووبکاتەوە پاش مردن ؟.

**خەڵکە کەم دەستەکە بە باغرەکانیان دەڵێن:**

﴿[21] وبرزوا لله جميعا﴾ وە هەموویان لەرۆژی قیامەتدا لەگۆڕەکانیان دەردەکەون لەبەردەم دەسەلاتی خوادا بۆ لێپرسینەوە ﴿فقال الضعفاء﴾ ئینجا کزو لاوازو شوێنکەوتووەکان دەڵێن: ﴿للذين استكبروا﴾ بەوانەی کەخۆیان

بەزل دەزانی ﴿إناكنا لكم تبعا﴾ بەڕاستی ئێمە لەدونیادا شوێنکەوتوو و پەیڕەوانی ئێوە بووین و، هەرچیتان بگوتبایە بەگوێمان دەکردن ﴿فهل انتم مغنون عنا من عذاب الله من شئ﴾ دە ئاخۆ ئێوە ئەمڕۆ دەتوانن لەبەشێ لەسزای خوا بمانپارێزن؟ ﴿قالوا لو هدانا الله﴾ ئەوانیش دەڵێن: ئەگەر خوا لەدنیادا ئێمەی بۆ خۆ رزگارکردن ڕێنما کردبا ﴿لهديناكم﴾ ئەوا ئێوەشمان لەگەڵ خۆمان شارەزاو ڕێنمادەکرد بۆ خۆ دەربازکردن لەم سزایە ئەمڕۆ دووچارمان بووە ﴿سواء علينا اجزعنا ام صبرنا﴾ جا ئێستاش ناڕەحەتیی و، بێتاقەتیی بکەین و بیکەینە دادو هاوار، یان بەئارامو لەسەرخۆو بێدەنگ بین، بۆ هەردوولامان یەکسانە و ڕزگارنابین ﴿ما لنا من محيص﴾ و هیچ دەرەتان و پەنایەکمان نیە بۆ رزگار بوون لەسزا.

الجزء الثالث عشر — سورة إبراهيم

أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِالْحَقِّ إِن يَشَأْ
يُذْهِبْكُمْ وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ ﴿١٩﴾ وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ بِعَزِيزٍ
﴿٢٠﴾ وَبَرَزُوا لِلَّهِ جَمِيعًا فَقَالَ الضُّعَفَاءُ لِلَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا
إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعًا فَهَلْ أَنتُم مُّغْنُونَ عَنَّا مِنْ عَذَابِ اللَّهِ
مِن شَيْءٍ قَالُوا لَوْ هَدَانَا اللَّهُ لَهَدَيْنَاكُمْ سَوَاءٌ عَلَيْنَا
أَجَزِعْنَا أَمْ صَبَرْنَا مَا لَنَا مِن مَّحِيصٍ ﴿٢١﴾ وَقَالَ الشَّيْطَانُ
لَمَّا قُضِيَ الْأَمْرُ إِنَّ اللَّهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ الْحَقِّ وَوَعَدتُّكُمْ
فَأَخْلَفْتُكُمْ وَمَا كَانَ لِيَ عَلَيْكُم مِّن سُلْطَانٍ إِلَّا أَن دَعَوْتُكُمْ
فَاسْتَجَبْتُمْ لِي فَلَا تَلُومُونِي وَلُومُوا أَنفُسَكُم مَّا أَنَا
بِمُصْرِخِكُمْ وَمَا أَنتُم بِمُصْرِخِيَّ إِنِّي كَفَرْتُ بِمَا
أَشْرَكْتُمُونِ مِن قَبْلُ إِنَّ الظَّالِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ
﴿٢٢﴾ وَأُدْخِلَ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ جَنَّاتٍ
تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِمْ تَحِيَّتُهُمْ
فِيهَا سَلَامٌ ﴿٢٣﴾ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا كَلِمَةً طَيِّبَةً
كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُهَا ثَابِتٌ وَفَرْعُهَا فِي السَّمَاءِ ﴿٢٤﴾

٢٥٨ — تُؤْتِي أُكُلَهَا

**وتارەکەی (ئیبلیس)و پۆزش هێنانەوەی بۆ پەیڕەوانی:**

﴿[٢٢] وقال الشيطان لما قُضِيَ الأمر﴾ جاکە کار لەکار ترازاو هەموو شتێك بڕایەوە، واتە: بەهەشتیی بۆ بەهەشت نێردراو، دۆزەخیش بۆ دۆزەخ، ئیتر دۆستە مەزن و گەورەکەیان (شەیتان) سەرزەنشتیان دەکاو دەڵێت: ﴿إن الله وعدكم وعد الحق﴾ بێگومان خوا لەدونیادا لەسەر زمانی پێغەمبەران بەڵێنێکی ڕاست و دروستی پێدان بەزیندوو بوونەوەو جەزاو پاداشت، وا هێنایە دی ﴿ووعدتكم﴾ و منیش بەڵێنی ناڕاست و درۆو دەلەسەم پێدان ﴿فاخلفتكم﴾ بەلاَم من بەڵێنەکەی خۆمم نەبردە سەرو بەپێچەوانەوە فریوم دان و ناتوانم یارمەتیتان بدەم ﴿وما كان لى عليكم من سلطان﴾ خۆ لەوکاتەیشدا هیچ هێزو دەسەلاَت و بەڵگەو نیشانەیەکم بەدەستەوە نەبوو، هەتا بەزۆر گوێڕایەڵتان بکەم ﴿إلا ان دعوتكم﴾ ئەمە نەبێت کەگومان و دوو دڵیم بۆ پەیداکردن و، بانگم کردن بۆ گومڕایی ﴿فاستجبتم لى﴾ خێرا ئێوەیش وەلاَمتان دامەوەو بەگوێتان کردم و بەدەنگمەوە هاتن ﴿فلا تلوموني﴾ جاکەوابوو ئەمڕۆ کەئێوە دووچار بوون، سەرکۆنەو سەرزەنشتی من مەکەن ﴿ولوموا انفسكم﴾ بەڵکو لۆمەو سەرزەنشتی خۆتان بکەن ﴿وما انا بمصرخكم﴾ و من ناتوانم فریاتان کەوم، هە تا لەسزا رزگارتان کەم ﴿وما انتم بمصرخي﴾ و ئێوەیش ناتوانن فریای من بکەون، هەتا لەسزا ڕزگارم بکەن ﴿إني كفرت بما اشركتموني من قبل﴾ دڵنیاشبن کە من بێزارم لەوە کە لەبەرا (واتە: لەدنیادا) منتان کردە شەریك و هاوەڵی خواو بەگوێتان کردم ﴿إن الظالمين لهم عذاب اليم﴾ ئەوجا خوای گەورە دەفەرموێ: بەڕاستیی ستەمکاران، ئەوانەی پشتیان لەهەق کرد، سزای ئێش پێگەیەنەروو ناڕەحەتکەریان بۆهەیە ﴿[٢٣] وأُدخل الذين آمنوا وعملوا الصالحات جنات﴾ ئەوانەش کەبڕوایان بەخوا هێناو کارەچاکەکانیان ئەنجامدا، دەبرێنە ناوەندیی چەند باخاتێکی بەهەشتەوە ﴿تجري من تحتها الأنهار﴾ کە چۆمە ئاوو ڕووبار بەژێر درەختەکانیاندا دەچێت ﴿خالدين فيها بإذن ربهم﴾ بەبڕیاری پەروەردگاریشیان هەتاهەتایە لەوێ

دەمێننەوە ﴿تحیتهم فیها سلام﴾ ڕێزو ئیحترامیان تێیدا بۆیەکتر هەرسڵاوو درووده، لەجێگایەکی تردا دەفەرموێ:
(.. وقال لهم خزنتها سلام علیکم..) ئەمەو ئایەت گەلێکی تر هەیە لەمەڕ سڵاوو درودی بەهەشتییەکان بۆیەکترو،
سڵاوی خواو سڵاوی فریشتەکانی بۆیان، پێویست بەهێنانیان ناکات.

## یەك خواپەرستی لەشەنگە داری دەچێ:

﴿[24] ألم تر کیف ضرب الله مثلا﴾ ئەرێ تۆ نازانی کەخوا چۆن مەسەل و نموونە دێنێتەوە ﴿کلمة طیبة کشجرة
طیبة﴾ بۆ وشەیەکی پاك و خێردارو سوود بەخش ﴿أصلها ثابت﴾ کەریشەو ڕەگیی لەنێو زەوییدا جێگیر بووبێ
﴿وفرعها فی السماء﴾ و لق و پۆپەکەشی چووبێ بەئاسماندا ﴿[25] تؤتی أکلها کل حین بإذن ربها﴾ هەمووکاتێ کە
کاتی خۆی هات بەرو میوە جاتەکەی بەفەرمانی
پەروەردگاری خۆی دەدا ﴿ویضرب الله الأمثال للناس﴾ وە
خوا ﷻ وێنەو نموونەی وردو سوود بەخش دێنێتەوە بۆ
خەڵکی ﴿لعلهم یتذکرون﴾ تا بەشکو بیربکەنەوەو عیبرەت و
پەندبگرن. بەڵێ وشەی یەك خوا پەرستی لەدڵی ئیمانداراندا
وەك ئەو درەختە وایە.

## شیرکیش هەموو لەدارێکی ناجسن دەچێ:

﴿[26] ومثل کلمة خبیثة﴾ ئەوجا نموونەی وشەی پیس و
ناپاك و بێ خێرو بەرەکەت (شیرك) ﴿کشجرة خبیثة﴾ وەکو
درەختێکی پیس و ناپاکو بێ سوودە ﴿اجتثت من فوق
الأرض﴾ بە ڕیشکەوە هەڵکێشرابێ و لەسەر زەویی فڕێ
درابێ ﴿ما لها من قرار﴾ مانەوەو قەراریی نەبێ، جا شیرك و
بێ باوەڕیش هەرچەندە کێوو دەشت و دەریاکان پڕبکاو
بیکاتە هەراو هۆسە، بەو درەختە پیسەیە دەچێ کە
بەڕیشکەوە هەڵکێشراوەو فڕێ دراوەتە سەرزەویی و
ناجێگیرە، چونکە هیچ ئەسڵ و بنەمایەکی نیە کەبەڵگەی
ژیریی و زانستی پشتگیری لێبکا ﴿[27] یثبت الله الذین آمنوا
بالقول الثابت﴾ جا ئەوانە کە باوەڕیان بەخواو بەگشت بڕیارەکانی خوا هێناوە، بەهۆی ئەم وشە جێگرو نەگۆڕاوەی
(لا إله إلا الله)وە خوا پێگەیان قایم و تابت دەکا ﴿فی الحیاة الدنیا وفی الآخرة﴾ لەژیانی ئەم دونیاو، لەژیانی
ئەودونیا ﴿ویضل الله الظالمین﴾ و ستەمکارانیش گومڕاو سەرلێشێواو دەکات ﴿ویفعل الله ما یشاء﴾ خوا بیەوێ
هەرشتێ بکات، زۆر بەئاسانی دەیکات، حەز بکا کێ ڕێنموونی بکاو، کێیش گومڕاو سەرلێشێواو بکا، ئەمانە
هەموو لە دەسەڵاتی ئەودان. پێشەوا (بوخاریی) ئەم فەرموودەیە دێنێ و دەڵێت: موسڵمان هەر کە خرایە گۆڕەوەو
پرسیاری لێکرا، خێرا بەهۆی ڕاستیی دنیایەوە شایەتمانێکی ڕاست و بەهەق دێنێ، مەبەستیش بەم ئایەتە کە خوا
دەفەرموێ: (یثبت الله الذین آمنوا بالقول الثابت..) هەر ئەمەیە، بۆیە لەوکاتە ناسك و تەنگەدا وەڵامی پرسیارەکانی
گۆڕی بۆئاسان دەکاو، لە گشت گرفتەکان دەیپارێزێ. بەڵام مرۆڤی لارو لاسارو خوانەناس کە خرایە گۆڕەوەو

الجزء الثالث عشر — سورة إبراهيم

تُؤۡتِيٓ أُكُلَهَا كُلَّ حِينِۭ بِإِذۡنِ رَبِّهَاۗ وَيَضۡرِبُ ٱللَّهُ ٱلۡأَمۡثَالَ
لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمۡ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٥﴾ وَمَثَلُ كَلِمَةٍ خَبِيثَةٍ
كَشَجَرَةٍ خَبِيثَةٍ ٱجۡتُثَّتۡ مِن فَوۡقِ ٱلۡأَرۡضِ مَا لَهَا مِن قَرَارٖ
﴿٢٦﴾ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلۡقَوۡلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ
ٱلدُّنۡيَا وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِۖ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَۚ وَيَفۡعَلُ
ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ ﴿٢٧﴾ ۞ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ بَدَّلُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ كُفۡرٗا
وَأَحَلُّواْ قَوۡمَهُمۡ دَارَ ٱلۡبَوَارِ ﴿٢٨﴾ جَهَنَّمَ يَصۡلَوۡنَهَاۖ وَبِئۡسَ
ٱلۡقَرَارُ ﴿٢٩﴾ وَجَعَلُواْ لِلَّهِ أَندَادٗا لِّيُضِلُّواْ عَن سَبِيلِهِۦۗ قُلۡ
تَمَتَّعُواْ فَإِنَّ مَصِيرَكُمۡ إِلَى ٱلنَّارِ ﴿٣٠﴾ قُل لِّعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ
ءَامَنُواْ يُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُنفِقُواْ مِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ سِرّٗا وَعَلَانِيَةٗ
مِّن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَ يَوۡمٞ لَّا بَيۡعٞ فِيهِ وَلَا خِلَٰلٌ ﴿٣١﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَخۡرَجَ
بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزۡقٗا لَّكُمۡۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلۡفُلۡكَ لِتَجۡرِيَ
فِي ٱلۡبَحۡرِ بِأَمۡرِهِۦۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلۡأَنۡهَٰرَ ﴿٣٢﴾ وَسَخَّرَ لَكُمُ
ٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ دَآئِبَيۡنِۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ ﴿٣٣﴾

٢٥٩

پرسیارەکانی لێکرا، دەحەپەسێ و وەکو شێتی لێدێ و هیچ نازانێ و سەرگەردانە ﴿<sup>٢٨</sup> ألم تر إلى الذين بدلوا نعمة الله كفرا﴾ ئاخۆ ئەوانەت نەبینی نیعمەت و بەخششەکانی خوا (ئیمان و بڕوا)یان گۆڕی بە کوفرو بێ باوەڕیی و سپڵەیی؟ واتە: لەباتی شوکرانە بژێریی نیعمەتی خوا، بێ باوەڕو کافربوون ﴿وأحلوا قومهم دار البوار﴾ هۆزەکەی خۆیانیان بردە ناو خانووی تیاچوون ﴿<sup>٢٩</sup> جهنم يصلونها﴾ ئەویش دۆزەخە دەچنە نێوی ﴿وبئس القرار﴾ ئای دۆزەخیش چ جێگایەکی خراپە بۆ دۆزەخییان ﴿<sup>٣٠</sup> وجعلوا لله أندادا﴾ هەر ئەو خوانەناسانە چەندین شەریك و هاوبەشیان بۆخوا دانا ﴿ليضلوا عن سبيله﴾ هەتا خەڵکی لەڕێگەی ئەولادەن و گومڕاو چەواشەی کەن ﴿قل تمتعوا﴾ ئەی موحەممەد ﷺ پێیان بڵێ: دەسا چەند ڕۆژێ بە ئارەزووی خۆتان لەژیانی دونیا بەهرەمەندبن و رابوێرن ﴿فإن مصيركم إلى النار﴾ ئەوە بزانن و دڵنیابن کە سەرەنجامی کارتان بۆ ئاگری دۆزەخ دەبێ.

## نوێژ بکەن و سامانیش ببەخشن:

﴿<sup>٣١</sup> قل لعبادي الذين آمنوا﴾ تۆبەو بەندانەم کە بڕوایان هێناوە بڵێ: ﴿يقيموا الصلاة﴾ بەڕێك و پێکی نوێژەکانیان بکەن ﴿وينفقوا مما رزقناهم سرا وعلانية﴾ و لەو ڕزق و ڕۆزیەی پێمان داون ببەخشن بەنهێنی و بەئاشکرا ﴿من قبل أن يأتي يوم لابيع فيه ولاخلال﴾ پێش ئەوەکە ڕۆژێ بێت (ڕۆژی دوایی) کە نەفرۆشتن و نەدۆستایەتی تێدایە، هەتا شتێ بکەن بۆ خۆیان.

## بەخششی خوا زۆر زۆرە:

﴿<sup>٣٢</sup> الله الذي خلق السموات والأرض﴾ خوا ئەو دەسەڵاتدارەیە ئاسمانەکان و زەویی دروستکردووە ﴿و أنزل من السماء ماء﴾ و لەئاسمان (هەور)ـەوە ئاوێکی باراندووە ﴿فأخرج به من الثمرات رزقا لكم﴾ ئینجا بەو ئاوەیە گەلێ میوەی جیاجیاو مەزە خۆشی لەزەوییدا رواندووەو دەرهێناوە، تابێ بەرزق و ڕۆزی بۆتان ﴿وسخر لكم الفلك﴾ وگەمیی و کەشتیەکانیشی بۆ رامکردوون ﴿لتجري في البحر بأمره﴾ کە بەدەسەڵات و فەرمانی خۆی لەدەریادا بەخۆتان و کەل و پەلتانەوە بێت و بچێ ﴿وسخر لكم الأنهار﴾ و چۆم و ڕووبارەکانیشی بۆ رامکردوون ﴿<sup>٣٣</sup> وسخر لكم الشمس والقمر دائبين﴾ خۆرو مانگیشی بەدائیمی بۆتان ژێر دەستە کردووە، واتە: هەمووکات دێن و دەڕۆن لەبەرخاتری ژیانی ئاسوودەی ئێوە ﴿وسخر لكم الليل والنهار﴾ و شەوو ڕۆژیشی بۆ رامکردوون، بەشەودا بحەوێنەوە، بەڕۆژیشدا هەوڵی ژیان بدەن ﴿<sup>٣٤</sup> وآتاكم من كل ما سألتموه﴾ وە لەهەرشتێك داواتان کردبێ و پێویستی ژیانتان بوو بێ پێیداون ﴿وإن تعدوا نعمة الله لا تحصوها﴾ ئەوانەیش وا باسمان کردن بۆتان، هەندێ بوون لەنیعمەتە بێ ژمارەکانی خوا، خۆئەگەر ئێوە بتانەوێ نیعمەتەکانی خوا بژمێرن ، هەرگیز لە ئەژمار نایەن بۆتان ﴿إن الإنسان لظلوم كفار﴾ بەڕاستیی مرۆڤی لاڕێ زۆر ستەمکارو کوفرکەرو سپڵەیە! بۆیە لەبەرامبەر ئەوهەموو بەخششانەوە ئەوەندە بەدنمەکەو پێنازانێت! پێغەمبەری خوا سپاسی خوای دەکردو دەیفەرموو: ((اللهم لك الحمد غير مكفيّ، ولا مودّع، ولا مستغنى عنه ربنا)) فتح الباري: ٩ /٤٩٣.

## دۆعاکەی ئیبراهیم، ئەودەمە کەئیسماعیلی لە پەنای کابەدا دانا:

﴿<sup>٣٥</sup> وإذ قال إبراهيم﴾ وەبیر بێنەو بۆ قەومەکەتی باس بکە کاتێ کە ئیبراهیم وتی: ﴿رب اجعل هذا البلد آمنا﴾ ئەی پەروەردگارم! ئەم شارەی (مەککە)یە کە کابەی پیرۆزی تێدایە بکە بەجێی ئەمن و ئاسایش وحەوانەوە بۆخەڵك و گیان لەبەران، خوای گەورەیش وەڵامی دۆعاکەی دایەوە، وەك لەجێگایەکی تردا فەرمووێ: (أولم يروا أنا جعلنا حرما آمنا..) یان دەفەرمووێ: (إن أول بيت وضع للناس للذي ببكة مباركا وهدى للعالمين فيه آيات بينات مقام

إبراهیم ومن دخله كان آمنا..) ﴿واجنبني وبنيّ ان نعبد الأصنام﴾ خوایه! خۆم و کوڕەکانم لەبتپەرستیی وەدوورخە، بەڵێ پێویستە دۆعاو پاڕانەوە بۆ صالح بوونی ماڵ و مناڵ و کوڕوکاڵ بکرێت، هەروەك ئیبراهیم لەخوا صەلاحەتی منداڵەکانی خواست ﴿[٣٦] رب إنهن أضللن كثيرا من الناس﴾ ئەی پەروەردگارم! بەڕاستیی ئەو بتانە خەڵکێکی زۆریان سەرلێشێواوو گومڕا کردووە ﴿فمن تبعني فإنه مني﴾ جا هەرکەسێك پەیڕەوی لەمن کردو شوێنی ئایینەکەی من کەوت، بێگومان ئەوە لە شوێنکەوتوانی منە ﴿ومن عصاني فإنك غفور رحيم﴾ و هەرکەسێکیش سەرپێچی و نافەرمانی کردم، دیارە تۆ بۆ خۆت چاکدەزانی چی ئەکەیت، چونکە بەڕاستیی تۆ زۆر لێبوردەیت، زۆریش دلاوایت بەرامبەر بەبەندەکانت ﴿[٣٧] ربنا إني اسكنت من ذريتي﴾ ئەی پەروەردگارمان! بێگومان من یەکێ لەمناڵەکانم (ئیسماعیل)ی کوڕم داناو جێم هێشت ﴿بواد غير زرع عند بيتك المحرم﴾ لەشیوو دۆڵێکی وشك و بێ دەرامەت، لای ماڵە پیرۆزو بەڕێزەکەی خۆت لە مەککەدا ﴿ربنا ليقيموا الصلاة﴾ ئەی پەروەردگاری ئێمە! بۆئەوەی لەوێ بەرێك و پێکی نوێژەکانیان بکەن و بێتاقەت نەبن ﴿فاجعل افئدة من الناس تهوى إليهم﴾ دەسا تۆش دڵی خەڵکێك رابکێشە بۆلایان، تا بەدڵ خۆشیان بوێن ﴿وارزقهم من الثمرات﴾ و لەو دۆڵ و شیوەدا میوەجات و رزق و رۆزییان بدەری ﴿لعلهم يشكرون﴾ تا بەڵکو بەباشی خواپەرستیی و سوپاسگوزاری تۆ بکەن. ﴿[٣٨] ربنا إنك تعلم ما نخفي وما نعلن﴾ ئەی پەروەردگاری ئێمە! بەڕاستیی تۆ بەهەمووشتێ دەزانی و ئاگاداریت، ئەوی بیشارینەوەو، ئەوی دەری بخەین و ئاشکرای بکەین ﴿وما يخفى على الله من شئ فى الأرض ولا فى السماء﴾ خۆ نە لەزەوییی، نە لەئاسمان، هیچ شتێك لەخوا پەنهان و شاراوە نیە، واتە: ئاگای لەو دۆعاو پاڕانەوەی منەو هەیەو، دەزانی بەچ مەبەستێك ئەو داوایەم کرد ﴿[٣٩] الحمدلله الذى وهب لى على الكبر إسماعيل واسحاق﴾ سوپاس هەر بۆ ئەوخوایە کەبەپیری (ئیسماعیل) و(ئیسحاق) ی پێ بەخشیم، بەڵێ.. ئەودەمە کەخوا ئیسماعیلی کردە خەڵاتی ئیبراهیم، تەمەنی ئیبراهیم (٩٩) ساڵ بوو، هەروەها کاتێکیش (ئیسحاق)ی پێبەخشیی تەمەنی (١١٢) ساڵ بوو ﴿إن ربى لسميع الدعاء﴾ بێگومان پەروەردگارم هەمیشە نزاو هاوارو پاڕانەوەی نزاکاران دەبیسێ و قەبووڵ دەکات ﴿[٤٠] رب اجعلني مقيم الصلاة ومن ذريتي﴾ ئەی پەروەردگارەکەم! خۆم و مناڵەکانم لە نوێژخوێنان دابنێ ﴿ربنا وتقبل دعاء﴾ ئەی پەروەردگارم! هاوارو دوعاکەم قبووڵ بکە ﴿[٤١] ربنا اغفر لى ولوالدى وللمؤمنين﴾ ئەی پەروەردگارمان! هەم لەخۆم و، هەم لەدایکم و بابم و، لەگشت باوەڕدارانیش خۆش ببە ﴿يوم يقوم الحساب﴾ لەو رۆژەدا حیساب و لێکۆڵینەوە بەرپا دەبێ.

الجزء الثالث عشر — سورة إبراهيم

وَءَاتَىٰكُم مِّن كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ وَإِن تَعُدُّوا نِعْمَتَ ٱللَّهِ
لَا تُحْصُوهَآ إِنَّ ٱلْإِنسَـٰنَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ ٣٤ وَإِذْ
قَالَ إِبْرَٰهِيمُ رَبِّ ٱجْعَلْ هَـٰذَا ٱلْبَلَدَ ءَامِنًا وَٱجْنُبْنِى وَبَنِىَّ
أَن نَّعْبُدَ ٱلْأَصْنَامَ ٣٥ رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ
فَمَن تَبِعَنِى فَإِنَّهُۥ مِنِّى وَمَنْ عَصَانِى فَإِنَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ٣٦
رَّبَّنَآ إِنِّىٓ أَسْكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِى بِوَادٍ غَيْرِ ذِى زَرْعٍ عِندَ بَيْتِكَ
ٱلْمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُوا ٱلصَّلَوٰةَ فَٱجْعَلْ أَفْـِٔدَةً مِّنَ ٱلنَّاسِ
تَهْوِىٓ إِلَيْهِمْ وَٱرْزُقْهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَشْكُرُونَ ٣٧
رَبَّنَآ إِنَّكَ تَعْلَمُ مَا نُخْفِى وَمَا نُعْلِنُ وَمَا يَخْفَىٰ عَلَى ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ
فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فِى ٱلسَّمَآءِ ٣٨ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى وَهَبَ لِى
عَلَى ٱلْكِبَرِ إِسْمَـٰعِيلَ وَإِسْحَـٰقَ إِنَّ رَبِّى لَسَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ ٣٩
رَبِّ ٱجْعَلْنِى مُقِيمَ ٱلصَّلَوٰةِ وَمِن ذُرِّيَّتِى رَبَّنَا وَتَقَبَّلْ
دُعَآءِ ٤٠ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لِى وَلِوَٰلِدَىَّ وَلِلْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ يَقُومُ
ٱلْحِسَابُ ٤١ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱللَّهَ غَـٰفِلًا عَمَّا يَعْمَلُ
ٱلظَّـٰلِمُونَ إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٍ تَشْخَصُ فِيهِ ٱلْأَبْصَـٰرُ ٤٢

**ئاگاداریی:** نزای لێخۆشبوون لە تاوان و گوناحی باوکی ، پێش ئەوە بۆی دەرکەوێ کەباوکیی ناحەزو دوژمنی خوایە، چونکە هەر کە بۆی دەرکەوت نەیارو دژی دینی خوایە، خێرا بەرائەتی لێکرد.

**خوا لە کردەوەی زاڵمان بێ ئاگانییە :**

﴿[42] ولا تحسبن الله غافلا عما يعمل الظالمون﴾ هەرگیز تۆ وا بیر مەکەرەوە کە خوا لە کاروکردەوەی ستەمکاران خافڵ و بێ ئاگابێت، نەخێر، بەڵکو بەهەموو کارێکیان زاناو ئاگادارە، بەڵام بۆماوەیەك مۆڵەتیان دەدات، پاشان دەیانگرێ و تۆڵەیان لێدەسێنێت، وەکو دەفەرموێ: ﴿إنما يؤخرهم ليوم تشخص فيه الأبصار﴾ هەر بۆئەو رۆژە دوایان دەخاو دەیانهێڵێتەوە کەئەوەندە سەختە گشت چاوێك لە ترسانا ئەبڵەق دەبن و، لە بزووتن دەکەون ﴿[43] مهطعين مقنعي رؤسهم﴾ و لە ترسانا بە پەلە بەرەو جارچی خوا دەچن و، بەسەر هەڵبڕاوی -بەرەو ئاسمان- ، هەروەکو کەسێك سەرو ملی رەق بووبێ و نەتوانێ بیسووڕێنێ ﴿لا يرتد إليهم طرفهم﴾ پێڵووی چاویشیان وەستاوەو نایەتە خوارەوە، واتە: لەبەر قورس و گرانی ئەورۆژە چاویان ئەبڵەق بووەو نایترووکێنن ﴿وافئدتهم هواء﴾ ودڵیشیان لەهەموو هەست و نەستێك بەتاڵ و حەتاڵە.

**سزا هات مۆڵەت نامێنێ:**

﴿[44] وانذر الناس يوم يأتيهم العذاب﴾ ئەی موحەممەد ﷺ ئەو خەڵکە لەسەختیو نارەحەتی رۆژێك بترسێنە کە سزاو جەزرەبەی خوایان بۆ دێت ﴿فيقول الذين ظلموا﴾ جا ئەوانەی ستەمیان کردووە، کاتێ سزاکە دەبینن دەڵێن: ﴿ربنا اخرنا إلى أجل قريب﴾ ئەی پەروەردگاری ئێمە! بۆماوەیەکی کەمیش بێت مۆڵەتمان بدەو ئاکاممان دوابخە ﴿نجب دعوتك﴾ تاوەڵامی بانگەوازەکەت بدەینەوە ﴿ونتبع الرسل﴾ و شوێنی پەیامبەران کەوین، وەکو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: (.. حتى إذا جاء أحدهم الموت قال رب ارجعون لعلى اعمل صالحا..) ﴿اولم تكونوا اقسمتم من قبل﴾ ئەوجا پێیان ئەوترێ: ئەی بۆ ئێوە نەبوون لەپێشەوە سوێندتان خوارد؟ ﴿مالكم من زوال﴾ کە هەرگیز فەناو نەمانتان بۆ نیەو، قیامەتیش نایەت، دەسا وابوو؟ وەیان دەفەرموێ: (واقسموا بالله جهد أيمانهم لايبعث الله من يموت..) ﴿[45] وسكنتم فى مساكن الذين ظلموا انفسهم﴾ و ئەی ئێوە جێی ئەوانەتان گرتەوە ستەمیان لەخۆیان کرد؟ ﴿وتبين لكم كيف فعلنا بهم﴾ و بۆتان روون بوویەوە کەچیمان پێکردن ﴿وضربنا لكم الأمثال﴾ و نەزیلەو نموونەی زۆریشمان لەبارەی گەلانی پێشوو بۆهێنانەوە، بەڵام ئێوە هیچ پەندێکتان لێوەرنەگرتن! وەکو دەفەرموێ: (حكمة بالغة فما تغن النذر..) ﴿[46] وقد مكروا مكرهم﴾ بێگومان بەرامبەر بەموسڵمانان درێغیان نەکردو نەوەستان لە ئەنجامدانی فرووفێڵی خۆیان ﴿وعندالله مكرهم﴾ بەڵام ئەنجامی فرووفێڵیان لای خوابوو ﴿وإن كان مكرهم لتزول منه الجبال﴾ و ئەگەریش فێڵیان ئەوەندە سەخت بوو

سُورَةُ إِبْرَاهِيمَ — الجُزْءُ الثَّالِثَ عَشَرَ

مُهْطِعِينَ مُقْنِعِي رُءُوسِهِمْ لَا يَرْتَدُّ إِلَيْهِمْ طَرْفُهُمْ وَأَفْـِٔدَتُهُمْ هَوَآءٌ ﴿٤٣﴾ وَأَنذِرِ ٱلنَّاسَ يَوْمَ يَأْتِيهِمُ ٱلْعَذَابُ فَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ رَبَّنَآ أَخِّرْنَآ إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍ نُّجِبْ دَعْوَتَكَ وَنَتَّبِعِ ٱلرُّسُلَ أَوَلَمْ تَكُونُوٓا۟ أَقْسَمْتُم مِّن قَبْلُ مَا لَكُم مِّن زَوَالٍ ﴿٤٤﴾ وَسَكَنتُمْ فِى مَسَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَتَبَيَّنَ لَكُمْ كَيْفَ فَعَلْنَا بِهِمْ وَضَرَبْنَا لَكُمُ ٱلْأَمْثَالَ ﴿٤٥﴾ وَقَدْ مَكَرُوا۟ مَكْرَهُمْ وَعِندَ ٱللَّهِ مَكْرُهُمْ وَإِن كَانَ مَكْرُهُمْ لِتَزُولَ مِنْهُ ٱلْجِبَالُ ﴿٤٦﴾ فَلَا تَحْسَبَنَّ ٱللَّهَ مُخْلِفَ وَعْدِهِۦ رُسُلَهُۥٓ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ ذُو ٱنتِقَامٍ ﴿٤٧﴾ يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ وَبَرَزُوا۟ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴿٤٨﴾ وَتَرَى ٱلْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ مُّقَرَّنِينَ فِى ٱلْأَصْفَادِ ﴿٤٩﴾ سَرَابِيلُهُم مِّن قَطِرَانٍ وَتَغْشَىٰ وُجُوهَهُمُ ٱلنَّارُ ﴿٥٠﴾ لِيَجْزِىَ ٱللَّهُ كُلَّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿٥١﴾ هَٰذَا بَلَٰغٌ لِّلنَّاسِ وَلِيُنذَرُوا۟ بِهِۦ وَلِيَعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ وَلِيَذَّكَّرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٥٢﴾

٢٦١

کێوەکانیشیان پێ هەڵدەتەکاندن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خوای گەورە هەر ئێوەی پاراست لەدەستیان و، ئێوەی سەر خست و ئەوانی تێشکاند.

**خوا لە بەڵێنەکانی خۆی پاشگەز نابێتەوە:**

﴿٤٧ فلا تحسبن الله مخلف وعده رسله﴾ جا لەبەرئەوە هەرگیز گومانی وا نەبەیت کەخوا بەرامبەر بەڵێنی خۆی کە بە پەیامبەرانی داوە، لە یارمەتیدانیان و لەناوبردنی دوژمنانیان پێچەوانەو نادروست بجوڵێتەوە ﴿إن الله عزيز ذو انتقام﴾ بێگومان خوا زۆر بەتواناو دەسەڵاتدارە، خاوەن تۆڵەیە، هیچ باڵادەستێکی نیە ﴿٤٨ يوم تبدل الأرض غير الأرض و السموات﴾ تۆڵەیان لێدەسێنێ لە رۆژی قیامەتدا کە ئەم زەوییەی ئێستایە ئەگۆڕدرێ بە زەوییەکی تر، ئاسمانەکانیش هەروا! لەفەرموودەیەکی(متفق عليه)دا هاتووە: خەڵکی سەرجەم لەرۆژی قیامەتدا لە زەوییەکی مەیلەو سوری کاکی بەکاکییدا کۆدەکرێنەوە بۆحەشرکردن ! فەرموودەیەکی تریش هەیە کەدایکمان عائیشە (خ) لەپێغەمبەر ﷺ دەپرسێ: ئەو رۆژە کە ئەم زەوییە نامێنێ، دەبێ مەردم گشت لەکوێ بن؟ ئەویش فەرمووی: لەسەر پردی(صیراط)ن، پێشەوا (ئەحمەد) ریوایەتی دەکات. فەرموودەیەکی تر دەڵێ: ژنانی وەسپ و سەناکەرانی مردوان، ئەگەر تەوبە نەکەن لەوکارەیان، ئەوا لەنێوان بەهەشت و دۆزەخدا رادەگیردرێن و، جل و بەرگەکانیان (قەتیران)ـەو، ئاگریش دەم وچاوو روخساریی داگرتون، موسلیم: ٢/٦٤٤ ﴿وبرزوا لله الواحد القهار﴾ ئەوجا هەموان لەگۆڕەکانیان دەهێنرێنە دەرو، دەبرێن بۆ بەردەم خوای تاك و تەنیای دەسەڵاتدار، وە لەدەشتێکی کاکیی بەکاکیدا دەنوێنرێن بێ ئەوەی پەردەیەك لەنێواندا بێت.

**تاوانباران بە زنجیر جەڵە دەکرێن:**

﴿٤٩ وترى المجرمين يومئذ مقرنين فى الأصفاد﴾ ئیتر لەو رۆژەدا تاوانباران دەبینی لەگەڵ هاوکارەکانی خۆیاندا کۆت و زنجیرکراون ﴿٥٠ سرابيلهم من قطران﴾ و جلك و کراسی بەریان قەترانی رەشە. قەتران: جەویەکی چەورو بۆگەنەو لەداری عەرعەر دێتەدەر، ئەوەندەش ماددەیەکی بە گڕو گەرمە بەسادە ترین شێوە ئاگر ئەگرێ، هەر بۆیەش لەنێو عەرەباندا وشتری گەری پێ چەور دەکرێ و بەکاری دەهێنن بۆ چارە سەری گەرۆڵی ﴿وتغشى وجوههم النار﴾ دەم وچاویشیان ئاگری دۆزەخ دایدەگرێت و دەیبرژێنێت ﴿٥١ ليجزى الله كل نفس ما كسبت﴾ بۆ ئەوە کەخوای گەورە پاداش و تۆڵەی هەموو کەسێك بەپێی ئەو کاروکردەوە کردوویەتی بداتەوە ﴿إن الله سريع الحساب﴾ بەراستیی خوا حسابکێشێکی چەسپانە، دەرەقەتی هەموان دێت.

**قورئان جاڕێکی جیهانیە بۆ گشت مەردم:**

﴿٥٢ هذا بلاغ للناس﴾ ئەم قورئانە راگەیاندنێکی گەورەو مەزنە بۆتەواوی خەڵکانی جیهان لەهەر جێگایەکدا بن، لەجێگایەکی تری قورئاندا دەفەرموێ: (..لأنذركم به ومن بلغ..) ﴿ولينذروا به﴾ و هەتا هەمووخەڵکێکی لەسزای خوا پێ بترسێنرێت ﴿وليعلموا انما هو إله واحد﴾ تاچاکیش بزانن کەئەو خوایە، خوایەکی تاكو تەنیاو بێ شەریك و بێ هاوەڵە ﴿و ليذكر أولوا الألباب﴾ وە تا خەڵکانی بە ئاوەزوو و هۆشیار پەندو ئامۆژگاری وەرگرن و پێی سەرفرازو بەختیاربن لە هەردوو جیهاندا.

زۆر سوپاسی خوای کارجوان دەکەم کە یارمەتیدام بۆ تەواوکردنی تەفسیری سوورەتی (ئیبراهیم/ﷺ).

کۆتایی جزمی (١٣) سێزدە

ولله الحمد والمنة

## ١٥ - سوورەتی ( حیجر )ــە.

## مەککەییەو ( ٩٩ ) ئایەتە.

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

* مەبەستی سەرەکیی لەم سوورەتەدا ڕاڤەکردنی بناغە سەرەکییەکانی دینی ئیسلامەو سەلماندنیانە ، وەك: یەکخواپەرستیی، پەیامبەریێتیی، زیندوو بوونەوەو پاداش و تۆڵە.. تەوەرەکەی بەدەوری دیاریکردنی پاشە ڕۆژو چارە نووسی زۆرداران و تاغووتاندا دەسوڕێتەوە، بەتایبەت ئەوانەی کە ڕوو بەڕووی پەیامبەرەکانیان دەوەستان و ڕێیان لێدەگرتن. بۆیە بەجۆرە داچڵەکاندنێك و هۆشیارکردنەوەیەك دەست پێ دەکات: (ربما یود الذین کفروا لو کانوا مسلمین * ذرهم یأکلوا ویتمتعوا ویلههم الأمل فسوف یعلمون).

* بانگێشەی پەیامبەران دەکا، لەگەڵ هەڵوێستی بەدبەختان و گومڕاکاندا لەتەکیاندا هەر لە (نووح)ـەوە ﷺ تا دواترین پەیامبەرمان (موحەممەد) ﷺ دڵخۆشیی پەیامبەر دەکاو پێی دەڵێت کە: وەنەبێت ئەوئازارو چەرمەسەرێیە تەنها لەگەڵ تۆدا کرابێت.. نەخێر، چونکە وەکو دەفەرموێ: (ولقد أرسلنا من قبلك فی شیع الأولین، وما یأتیهم من رسول إلا کانوا به یستهزئون). پێغەمبەرانی زۆر هاتوون و گاڵتەیان پێکراوەو، هەر درێژەیشیان بە تێکۆشانیان داوەو، کۆڵیان نەداوە.

* چەند بەڵگەیەك بۆ گەورەیی و دەسەڵاتی خوای کارزان -لەبوونەوەردا- دێنێتەوە: دیمەنی ئاسمان ، زەویی، "بای" قورس و متوربەکەر، ژیان و مردن، زیندووبوونەوەو کۆبوونەوە.. (ولقد جعلنا فی السماء بروجا وزیناها للناظرین).

* داستانە مەزنەکەی مرۆڤایەتیی.. کە لەدروستکردنی بابە (ئادەم)ـەوە دەست پێ دەکات.. دوژمنایەتی کردنی (ئیبلیس).. کڕنووشی فریشتەکان بۆ ئادەم، لووت بەرزیی و ئیبای شەیتان.. (وإذ قال ربك للملائکة إنی خالق بشرا من صلصال من حمإ مسنون).

* پاشان باسی بەسەرهاتی هەندێ لەپەیامبەران -علیهم الصلاة والسلام- دەکا، وەك (لوط، شعیب، صالح) بەمەبەستی خۆڕاگرتن و ئارامیی پەیامبەر ﷺ.

* کۆتاییشی دێت بە وەبیرهێنانەوەی ئەو بەهرە گەورەیەی قورئانە کە: خوا بە پێغەمبەری بەخشیوەو چۆنیش داوای دڵ ئەستووریی و خۆڕاگرتنی لێ دەکات لەکاتی تەنگانەدا" (ولقد آتیناك سبعا من المثانی والقرآن العظیم).

ناویش نراوە سوورەتی (حیجر) چونکە خوای گەورە باسی (سەموود)ی نەتەوەکەی (صالح) پێغەمبەر دەکات کە لە (حیجر) دەژیان.

**حیجـــر**: شوێنێکە لەنێوان مەدینەو شامداو، ئێستەش ئاسەواری هەرماوە، گەلێکی زۆر ئازاو لێهاتوو و هەڵکەوتەو بەتوانا بوون, لەشاخەکان وا خانوو بەرەیان بۆ خۆیان دەتاشیی، دەتگوت قەت نامرن، جا لەوحاڵە خۆشەیاندا قاری خوای گەورە هات و ئیبادەی کردن: (فأخذتهم الصیحة مصبحین، فما أغنی عنهم ماکانوا یکسبون) .

### ڕۆژێ دێ خوانەناس ئاوات دەخوازێ موسڵمان بووبا :

﴿بسم الله الرحمن الرحیم * [1] الر﴾ ئەم کتێبە کە پڕە لەچەندین شتی زۆر گرنگ، هەر لەم جۆرە پیتانە پێکهاتووە، جا ئەگەر ئێوە نکووڵی دەکەن، دەسا فەرموون شتێکی وا بهێنن ﴿تلك آیات الکتاب وقرآن مبین﴾ ئەمانە

ئایەتی کتێب و قورئانێکی ئاشکرایە ، کە لەڕەوانبێژیی و خۆشخوانییدا وێنەی هەر نییەو، گشت ڕێنما ڕاست و چەوتەکانیش ڕۆشن دەکاتەوە ﴿٢ ربما یود الذین کفروا لو کانوا مسلمین﴾ ئەو کەسانەی کە لەدنیادا خوا نەناسبوون ، کاتێ لە ڕۆژی قیامەتدا سزا دەبینن ، گەلێ جار ئاوات ئەخوازن کە: خۆزگا موسڵمان بووبان، بەتایبەتی ئەو ڕۆژە کە موسڵمانەکان دەبینن لەدۆزەخ دێنە دەرێ و ڕزگاریان دەبێ ﴿٣ ذرهم یأکلوا ویتمتعوا﴾ تۆش ئەی پێغەمبەر! ﷺ وازیان لێ بێنە با هەروەك ئاژەڵ بۆماوەیەکی کەم بخۆن و ڕابوێرن ! ﴿ویلههم الأمل﴾ و هیواو ئاواتەکانیشیان سەرگەرم و سەرقاڵیان بکاو، بیان خافڵێنێ و تەوبە نەکەن ﴿فسوف یعلمون﴾ ئەوجا بۆدوایی دەزانن چییان پێ دەکەین، لە جێگایەکی تردا تەئکید لەسەر ئەوە دەفەرموێ: (قل تمتعوا فإن مصیرکم إلی النار..) یان دەفەرموێ: (کلوا وتمتعوا قلیلا إنکم مجرمون).

الجزء الرابع عشر سُورَةُ الحِجرِ

سُورَةُ الحِجرِ — ترتيبها ١٥ — آياتها ٩٩

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓرۚ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ وَقُرْءَانٍ مُّبِينٍ ﴿١﴾ رُّبَمَا يَوَدُّ
ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوْ كَانُوا۟ مُسْلِمِينَ ﴿٢﴾ ذَرْهُمْ يَأْكُلُوا۟
وَيَتَمَتَّعُوا۟ وَيُلْهِهِمُ ٱلْأَمَلُۖ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٣﴾ وَمَآ أَهْلَكْنَا
مِن قَرْيَةٍ إِلَّا وَلَهَا كِتَابٌ مَّعْلُومٌ ﴿٤﴾ مَّا تَسْبِقُ مِنْ أُمَّةٍ
أَجَلَهَا وَمَا يَسْتَـْٔخِرُونَ ﴿٥﴾ وَقَالُوا۟ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِى نُزِّلَ عَلَيْهِ
ٱلذِّكْرُ إِنَّكَ لَمَجْنُونٌ ﴿٦﴾ لَّوْ مَا تَأْتِينَا بِٱلْمَلَٰٓئِكَةِ إِن كُنتَ
مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٧﴾ مَا نُنَزِّلُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَمَا كَانُوٓا۟
إِذًا مُّنظَرِينَ ﴿٨﴾ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴿٩﴾
وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِى شِيَعِ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٠﴾ وَمَا يَأْتِيهِم مِّن
رَّسُولٍ إِلَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿١١﴾ كَذَٰلِكَ نَسْلُكُهُۥ فِى
قُلُوبِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿١٢﴾ لَا يُؤْمِنُونَ بِهِۦۖ وَقَدْ خَلَتْ سُنَّةُ ٱلْأَوَّلِينَ
﴿١٣﴾ وَلَوْ فَتَحْنَا عَلَيْهِم بَابًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فَظَلُّوا۟ فِيهِ يَعْرُجُونَ
﴿١٤﴾ لَقَالُوٓا۟ إِنَّمَا سُكِّرَتْ أَبْصَٰرُنَا بَلْ نَحْنُ قَوْمٌ مَّسْحُورُونَ ﴿١٥﴾

وَلَقَدْ جَعَلْنَا ٢٦٢

**هەموو شارێ ماوەو ئاکامێکی بۆدانراوە:**

﴿٤ وما اهلکنا من قریة﴾ وە ئێمە خەڵکی هیچ شارو گوندێکمان لەناو نەبردووە، لەوانە باوەڕیان بە پەیامبەرەکانیان نەهێنا، ئەگەر داوای دابەزینی سزاشیان کردبێ ﴿إلا ولها کتاب معلوم﴾ مەگەر پێش لەناو بردنیان نامەو ئاکامێکی دیاریی کراویان هەبووە ﴿٥ ما تسبق من امة اجلها﴾ بیشزانن کە هیچ هۆزو گەلێك پێش ئاکامی خۆیان ناکەون ﴿وما یستأخرون﴾ و لێیشی دوا ناکەون، کەواتە ئێوەش هۆشیار بن! هەرکات ئاکامتان هات دەپێچرێنەوە.

**پێغەمبەر دەکەنە شێت و لێوە !:**

﴿٦ وقالوا یا ایها الذی نزل علیه الذکر﴾ بێ باوەڕەکان -بەگاڵتەوە- بەپەیامبەریان ﷺ گوت: ئەی ئەو کەسەی - وەك خۆت دەڵێیت - قورئانت بۆ هاتووە ! ﴿إنك لمجنون﴾ دڵنیابە تۆ دێوانەو شێتی! دیارە ئەو نەفام و شێتانە دەیانەوێ بەو وتە ناقۆڵاو بێ وێڵانەیان پێغەمبەر ﷺ دڵ تەنگ و ناڕەحەت بکەن، ئەگینە بۆخۆیشیان دەیناسن کە شێت نییە ، بەڵکو لەو پەڕی ژیریی و ئاوەزدایە ﴿٧ لو ما تأتینا بالملائکة إن کنت من الصادقین﴾ باشە! ئەگەر تۆ لەڕاستگۆیانیت - کە دەڵێیت من پەیامبەرم- دە بۆ فریشتەکان ناهێنیتە لامان با شایەدیت بۆ بدەن کە: تۆ پێغەمبەریت ، لە گەلێ جێگای تردا قورئانی پیرۆز ئەو قسەلۆکانەیان دەگێڕێتەوە، بۆ نموونە: (فلولا القی علیه أسْورة من ذهب أو جاء معه الملائکة مقترنین) یان دەفەرموێ: (وقال الذین لایرجون لقاءنا لولا أنزل علینا الملائکة أو نری ربنا..) ﴿٨ ما ننزل الملائکة إلا بالحق﴾ لە وەڵامیاندا دەفەرموێ: ئێمەش بەهەق نەبێت هەر گیز فریشتە نانێرین ، واتە: یا بۆ پەیامهێنان بۆ پێغەمبەران دەیان نێرین ، یان بۆ سزادانی خوا نەناس و موشریکان و ..هتد ﴿وما کانوا إذا منظرین﴾ کە هاتیشن ئیتر ئەوانە مۆڵەت نادرێن و، گورج لەناو دەبرێن.

**خۆمان ئەم قورئانە دەپارێزین:**

﴿٩ إنا نحن نزلنا الذكر وإنا له لحافظون﴾ بەڕاستیی ئێمە خۆمان ئەم قورئانەمان ناردۆتە خوارێ و، هەر خۆیشمانین ئاگادارو پارێزەریی و، لەدوژمنان ئەیپارێزین و ناهێڵین زێدو کەمی تێدا بکەن ، بۆیە ئەوە چەندین سەدە هات و چوو ، لەگەڵ ئەو هەموو دژو نەیارانەدا ، کەسێك نەیتوانیوە تەنها پیتێکی بگۆڕێ، یان لێی لاببات.

**هەموو پێغەمبەرێ تانەو تەشەری لێدراوە:**

﴿١٠ ولقد ارسلنا من قبلك فى شيع الأولين﴾ بێگومان لەناو کۆمەڵ و گەلانی پێش تۆیشدا پەیامبەر گەلێکمان نارد ﴿١١ وما يأتيهم من رسول﴾ ئەوانە هەر پەیامبەرێکیان بۆ دەهات ﴿إلا كانوا به يستهزئون﴾ ئیللا گاڵتەیان پێ دەکرد، جا کەوایە تۆیش دڵت بۆ خۆت دانەمێنێ کەقورەیش گاڵتەت پێدەکەن ﴿١٢ كذلك نسلكه فى قلوب المجرمين﴾ هەر چۆنێ سەرسەختیی و عینادیمان خستە دڵی پێشینانەوەو، بڕوایان بەپێغەمبەرەکانیان نەهێنا، هەر ئاوایش نکووڵی و بێزاریی و شیرك دەخەینە دڵی تاوانبارەکانی سەردەمی تۆیشەوە ﴿١٣ لا يؤمنون به﴾ و بڕوا ناهێنن بە قورئان ﴿وقد خلت سنة الأولين﴾ بەڕاستیی باوو عادەتی خوا لە گەلانی سەرسەختیی پێشوودا رابورد بە لەناو بردنی ئەوەی باوەڕی بەنیشانەو موعجیزەکان نەهێنا، واتە: چۆن فەوتان و لەناو چوون .

**چەندە موعجیزە بێنی بۆ خوا نەناسان ، هەر باوەڕ ناکەن:**

﴿١٤ ولو فتحنا عليهم بابا من السماء﴾ ئەو موشریکانە ئەوەندە ئەهلی عینادن کە: ئەگەر لە ئاسمانیش دەرگایەکیان بۆ بکەینەوە ﴿فظلوا فيه يعرجون﴾ و ئینجا لەوێوە سەرکەون و، پاشان بەچاوی خۆیان فریشتەکان ببینن و شایەتیت بۆ بدەن ﴿١٥ لقالوا إنما سكرت ابصارنا﴾ بێ شك هەر دەڵێن: چاومان تێکدراوەو" هەقیقەتەکان وەك خۆیان نابینین ﴿بل نحن قوم مسحورون﴾ نەخێر، ئەوانە ئێمە دیتمانن فریشتە نەبوون، بەڵکو ئێمە گەلێکی جادوو لێکراوین !! واتە: جادوومان لێکراوە بۆیە حەقیقەتەکان بەپێچەوانەوە دەبینین, کەوابوو ئەوانە تەنها بەعینادی باوەڕ ناهێنن ، تۆش چەندە هەوڵ بدەیت بۆ نەهێشتنی بیانووەکانیان بێسوودە ﴿١٦ ولقد جعلنا فى السماء بروجا﴾ وە بەڕاستیی ئەستێرە گەلێکی رووناکمان خستۆتە ئاسمانەوە، یان چەند (بورج) و جێگەیەکمان بۆ هاتوو چۆی ئەستێرەو خۆرو مانگ لە ئاسماندا داناوە. عەرەبەکان بۆ زانین و ناسینی کاتو ساتی ئیش و کارەکانیان ئەو شوێن و (بورج)انەیان بەدوازدە هەژمارد، هەر یەکەشیان بەپێی ئەقڵی ئەوسەردەمەیان ناوێکیان بۆ دانابوو, وەك: بورجی (بەرخ، گا، جەوزا، قرژاڵ، شێر، گوڵ، تەرازوو، دووپشك، کەوان، جەدی، سەتڵ، ماسی).

**خوێنەری هێژا:** لەکاتی نووسینی ئەم کورتە تەفسیرەدا دیتم (عەلمانی)یەکان = کە باوەڕیان بە (میتافیزیقی)و (ماوراء الطبيعة) نیەو، هەمووشتێك بەلای ئەوانەوە هەرئەوەیە کەچاو دەیبینێ = زۆرێکیان بە بورجەکاندا هەڵدەدا, بۆ نموونە دەیانگوت: هەرکەسێك لە مانگی ئەوەندەدا لە دایکبووبێ، ئاییندەو چارەنووسی و (بەخت و ناوچاوی باش دەبێ، یان بێ بەخت و چارە ڕەش دەبێ!) جامنیش بەواجبێکی ئیسلامیم زانی کە لە دیدی ئیسلامەوە ڕوونکردنەوەیەك لەسەرئەو ڕاو بۆچوونەیە بنووسم، بە هیوای دەرکەوتنی هەق و ڕاستییەکان و، گەڕانەوەی ئەوانیش بۆ سەر ڕای ڕاستەقینە: **یەکەم**: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((مَنْ أَتى عَرّافاً فَسأَلَهُ عَنْ شى لَمْ تُقْبَل الصَلاة أرْبَعينَ لَيْلَة)) موسلیم/٢٢٣٠، واتە: هەرکەسێك شتێك لە ئەستێرە ناسێك بپرسێت، ئەوا نوێژی چل دانە ڕۆژی وەرناگیردرێ (ئەگەر پێی کافر نەبێت !). **دووەم**: لەپێغەمبەریان پرسی، دەربارەی (کاهین= نقلانە) چی، ئەویش فەرمووی: ((لَيْسوا بِشىء)) لەسەر هیچ بنەمایەك نین و فڕیان بەڕاستییەوە نییە، گوتیان: خۆ ئاخر برێ جار ڕاست

دەڵێن: ئەویش فەرمووی: ((تِلْكَ الكَلِمَةُ مِنَ الحَقِّ يَخْطَفُهاالجِنِيُّ فَيُقَرقِرُها فى اُذُنِ وَلِيِّه، فَيَخْلِطونَ مَعَها (اَكْثَرَ مِنْ) مَأَةِ كِذْبَةٍ)) مسلم، ١٥٦٨/٤١، بەڵێ دەکرێ کە: (جن)یەکان یەك بێژەو وشە بفرێنن و، بیخەنە گوێی دۆستەکانیانەوە، پاشان ئەوانیش سەد درۆی پێوە بنێن. سێیەم: (زەیدی کوڕی خالید) دەڵێ: کاتێ لە حودەیبییەدا بووین ، پەڵە هەورێك بەئاسمانەوە دەرکەوت، ئەوجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((اتدرون ماذا قال ربكم الليلة ؟)) واتە: ئەرێ دەزانن پەروەرێنتان ئەمشەو چی گوت؟ گوتیان: مەگەر هەر خواو پێغەمبەرەکەی بزانن، فەرمووی: ((أصبح من عبادى مؤمن بى وكافر)) بەندەکان بوونە دوو بەرەوە: هەندێ بوونە خاوەن باوەڕ، هەندێك بوونە کافرو خوانەناس ((فأما من قال: مُطِرْنا بفضل الله ورحمته، فذلك مؤمن بى، كافر بالكوكب)) واتە: ئەو کەسەی دەڵێت: هەر بە فەزڵ و میهرەبانی خوا بارانمان بۆ دەبارێ، قسەکەی راستەو، باوەڕیشی بەخوا هەیەو هەقەو، نکووڵی و حاشای لە ئەستێرانە. ((و أما من قال: مُطِرنا بنَوْء كذا و كذا، فذلك كافر بى، مؤمن بالكوكب)) بوخاریی/٨٤٦، موسلیم٧١. ئەو کەسەش بڵێ: بەهۆی ئەو ئەستێرەیەوە بارانمان بۆ دەبارێ، دیارە ئەوە باوەڕی بەخوا نییەو، ئەستێرەکان بەهەق دەناسێت!. چوارەم: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((أربع فى أمتى من أمر الجاهلية، لا يتركونهن" الفخر بالأحساب، والطعن فى الأنساب، والإستسقاء بالأنواء، والنياحة)) موسلیم/٩٣٤. واتە: چوار شت هەن لەکارە خراپەکانی سەردەمی جاهلیەتن و، لەناو ئوممەتی منیشدا هەردەمێنن و وازیان لێناهێنن: ١) خۆهەڵکێشان بە بنەماڵەو عەشیرەتەوە!. ٢) تانەو تەشەر لەنەسەب و بنەرەتی یەکترا. ٣) خواستنی باران لە ئەستێرەکان!. ٤) شین و وەیرۆ بەشوێن مردووواندا !. بەڵێ.. هەر خێرو شەڕێك لە ئەستێرەکانەوە بناسرێ و بخوازرێ ، ئەوە حەرام و قەدەغەیە، وەکو لە فەرموودەکاندا باسکراوە، بۆ نموونە دەگوترێ: ئەگەر لە فلانە، مانگدا لە دایکبوویت، ئەوە ژیانت خۆش دەبێ ، سەرکەوتوو دەبێ، بڕوانامە وەردەگرێ، هیچ کۆسپ و لەمپەرێك نایەتە رێگای،.. هتد. کردنی ئەم جۆرە گوتانەو، باوەڕبوون پێیان، ئەگەر مرۆڤی پێ کافر نەبێت، بێگومانبن دەبێتە موشریك و هاوبەشدانەر بۆ خوا، ئاشکرایە کە بیرو بۆ چوونی ئاوا بەتایبەتی لەم سەدەی بیست و یەکەدا زۆر جێگەی سەیرو سەمەرەیە! چونکە خەڵکانی هەڵگری عەلمانییەت ، بڕوای بەهیچ شتێکی نادیارو (ماوراء الطبيعة) نییە، کەچی لەولایشەوە بڕوا بەوشتە تورەهات و ئەفسانانە دەکەن، پێیان وایە شەنس و نگینیان بە فلانە ئەستێرەوەیە.

خوێنەری بەڕێز: ئەم جۆرە مەسەلانە" ئەو ئەستێرە باران دەبارێنێ و ئەگەر لەفلانە مانگدا لەدایکبوویت سەرکەوتوو دەبیت، ئەمانەو چەندین بیروو بۆچوونی تری ئاوا، لەدینی ئیسلامی پیرۆزدا قبوول نین و بە کارێکی ئەفسانەیان دادەنێ، من وادەزانم ئەو کەسانەی ئەوبیرو باوەڕەیان هەیە ، بۆخۆیان رووخاون و، لەبەردەم گیروگرفت و کۆسپەکانی ژیاندا هەرەسیان هێناوە، دەیانەوێ (بەخەیاڵی خۆیان) بەو شتانە تین و گوڕێك بە خۆیان بدەنەوە، لەولایشەوە ئەوانە کە پەرچەمی بی دینی و (عەلمانییەت)یان بەرز کردۆتەوە، نابێ بگەڕێنەوە بۆلای شتە (غەیب)و نادیارەکان، ئەگینە بەرنامەکەیان هەڵدەوەشێتەوەو، دەکرێ باوەڕیان بە (غەیب) ببێ و، باوەڕیان بە هەندێکی نەبێت! دڵنیاش بن کە دیارییکردنی چارەنووس و بەخت خوێندنەوە، تەنیاو تەنیا هەرخوای باڵادەست دەیزانێ و، ئەنجامی ئەمانەش کەئەوان دڵی خۆیانی پێخۆش دەکەن بەسەراوە بەهەوڵ و تێکۆشان و جیهادو خۆماندووکردنەوە، نەك بەوە کە لەفلانە (بورج)دا لە دایك ببێت. ﴿وزيناها للناظرين﴾ وەپێیانمان رازاندۆتەوە بۆ تەماشا کەران ، لەجێگایەکی دیکەدا دەفەرموێ: (تبارك الذى جعل فى السماء بروجا) ﴿[١٧] وحفظناها من كل شيطان رجيم﴾ ئاسمانیشمان پاراستووە لەهەر شەیتانێکی نەفرین لێکراو، واتە: هەر کاتێ شەیاتینەکان دەیانەوێ

به (الملأ الأعلى)وه بۆ دزینی نهێنیەکانیان نزیك ببنەوە، ئەوا ئێستا ڕێیان لێگیرا، چونکە شەیتان تەنها بۆ ئەم سەر زەوییە دروستکراوەو کارەکانیشی هەر لێرەن ﴿[١٨] إلا من استرق السمع﴾ بەڵام ئەوەیان کە بییەوێ گوێ بگرێ و شتێك لەهەواڵی ئاسمان بدزێ بۆ سەرگەردان کردنی خەڵکیی ﴿فأتبعه شهاب مبين﴾ شۆلە ئاگرێکی ڕووناك دوای دەکەوێ ، ئەگەر بەری بکەوێ ئەیسوتێنێ ﴿[١٩] والأرض مددناها﴾ وە یەکێ تر لەنیعمەتەکانمان بەسەر مرۆڤەوە ئەوەیە کە زەویمان بەپان و بەرین لەپێش چاویدا بۆ هاتوچۆو ژیانی کردە ڕایەخ، وەك لەجێگایەکی تردا ئەفەرموێ: (والأرض فرشناها فنعم الماهدون)٥١/٤٨. ﴿والقينا فيها رواسي﴾ وە بۆ ئەوە کە زەویی سەرنشینەکانی هەڵنەدێرێ ، چەند کێوێکی بەرزو تابتمان تێهاویشت ﴿وانبتنا فيها من كل شيء موزون﴾ وە زۆر بەوردی و پڕ لە حیکمەت و مەزەندەکاریی، هەموو جۆرە شتێکمان بەدی هێناو، گشت ڕووەکێکمان تیا ڕواند. ﴿[٢٠] وجعلنا لكم فيها معايش﴾ وە هۆکاری گوزەران و ژیانی ئێوەشمان تێدانا ﴿ومن لستم له برازقين﴾ هاوڕێ لەگەڵ ژیانی ئەوانەش، کە ئێوە ڕۆزی دەریان نین" وەك منداڵ و کۆیلەو ئاژەڵەکان، چونکە خۆیشتان و ئەوانیش ڕۆزیتان هەر لەسەر خوایە، جا بەتایبەت لاوازو بێ دەسەڵات.

الجزء الرابع عشر — سورة الحجر

وَلَقَدْ جَعَلْنَا فِي السَّمَاءِ بُرُوجًا وَزَيَّنَّاهَا لِلنَّاظِرِينَ ﴿١٦﴾ وَحَفِظْنَاهَا مِن كُلِّ شَيْطَانٍ رَّجِيمٍ ﴿١٧﴾ إِلَّا مَنِ اسْتَرَقَ السَّمْعَ فَأَتْبَعَهُ شِهَابٌ مُّبِينٌ ﴿١٨﴾ وَالْأَرْضَ مَدَدْنَاهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَاسِيَ وَأَنبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ شَيْءٍ مَّوْزُونٍ ﴿١٩﴾ وَجَعَلْنَا لَكُمْ فِيهَا مَعَايِشَ وَمَن لَّسْتُمْ لَهُ بِرَازِقِينَ ﴿٢٠﴾ وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلَّا عِندَنَا خَزَائِنُهُ وَمَا نُنَزِّلُهُ إِلَّا بِقَدَرٍ مَّعْلُومٍ ﴿٢١﴾ وَأَرْسَلْنَا الرِّيَاحَ لَوَاقِحَ فَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَسْقَيْنَاكُمُوهُ وَمَا أَنتُمْ لَهُ بِخَازِنِينَ ﴿٢٢﴾ وَإِنَّا لَنَحْنُ نُحْيِي وَنُمِيتُ وَنَحْنُ الْوَارِثُونَ ﴿٢٣﴾ وَلَقَدْ عَلِمْنَا الْمُسْتَقْدِمِينَ مِنكُمْ وَلَقَدْ عَلِمْنَا الْمُسْتَأْخِرِينَ ﴿٢٤﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ هُوَ يَحْشُرُهُمْ إِنَّهُ حَكِيمٌ عَلِيمٌ ﴿٢٥﴾ وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن صَلْصَالٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ﴿٢٦﴾ وَالْجَانَّ خَلَقْنَاهُ مِن قَبْلُ مِن نَّارِ السَّمُومِ ﴿٢٧﴾ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي خَالِقٌ بَشَرًا مِّن صَلْصَالٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ﴿٢٨﴾ فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُوا لَهُ سَاجِدِينَ ﴿٢٩﴾ فَسَجَدَ الْمَلَائِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ ﴿٣٠﴾ إِلَّا إِبْلِيسَ أَبَىٰ أَن يَكُونَ مَعَ السَّاجِدِينَ ﴿٣١﴾

٢٦٣

**کلیلی هەموو گەنجینەیەك هەر لای خوایە:**

﴿[٢١] وإن من شئ إلا عندنا خزائنه﴾ وە گەنجینەکانی هەموو شتێك هەر لای ئێمەیە، ئێمە دەزانین ئەکوێیەو چۆن پێکهاتووە، بۆ نموونە: لەچەند گەردیلەیەکی هایدرۆجین و ئۆکسجین($H_2O$) ئاومان پێك هێناوەو هەر خۆیشمان چاك دەزانین حەقیقەتەکەی چییە؟ ﴿وما ننزله إلا بقدر معلوم﴾ جا لەگەڵ ئەوەیشدا هەر بەئەندازەیەکی دیاریی کراوو پێویست ئەینێرینە خوار. (ئیبن جەریر) لە (عەبدوڵلای کوڕی مەسعود)ەوە ئەڵێت: بارانی هیچ ساڵێك لەساڵێکی تر، پتر نیە، بەڵام خوا ساڵێك لێرە دەیبارێنێ ، ساڵێك لە شوێنێکی تر، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (وما من شيء إلا عندنا خزائنه). ﴿[٢٢] وارسلنا الرياح لواقح﴾ با کانیشمان ناردن بۆ متوربەکەردنی هەورەکان، واتە: (با) هەورەکان بەسەر یەکا ئەکوتێ و ئەوجا ئاویان لێ پەیدا دەبێت، هەروەك وشتری مێ بەنێرەکەی متوربە دەکرێ، هەورەکانیش بە باکان (موتوربە) دەکرێن ، لەجێگایەکی تردا دەفەرموێ: (افرأيتم الماء الذى تشربون أانتم انزلتموه من المزن أم نحن المنزلون ..) ﴿فأنزلنا من السماء ماء﴾ ئینجا لەو ئاسمانەوە ئاوێکمان نارده خوارەوە ﴿فأسقيناكموه﴾ و کردمانە ئاوی خواردنەوەتان و پێتانی دەنۆشین، واتە: چ خۆتان و، چ مەڕو ماڵاتتانی پێ تێرئاو دەکەین ﴿وما انتم له بخازنين﴾ خۆ ئێوە ناشتوانن لەلای خۆتان ڕایگرن لە ناو دەریاو ڕووبارو کانیاوو شیوو دۆڵەکاندا، بەڵکو ئێمە ڕایدەگرین و کۆیدەکەینەوە لەناو کانیاوو گۆم و گۆلاوەکان و.. هتد ﴿[٢٣] وإنا لنحن نحيي ونميت﴾ بێگومان هەر خۆشمانین کە ژیان دەبەخشین و مردووەکان زیندوو

ئەکەینەوە، زیندووەکانیش ئەمرێنین، واتە مردن و ژیان هەر بەدەستی خۆمانە ﴿ونحن الوارثون﴾ هەر ئێمەشین میراتگری هەموو بوونەوەرو، پاش ئەوان بەبەردەوامی دەمێنینەوە ، ئیتر هەمووشتێك تیا دەچێت" وەك لەئایەتی تردا ئەفەرمووێ: (إنا نحن نرث الأرض ومن عليها وإلينا يرجعون)١٥/٤٠. ﴿[٢٤] ولقد علمنا المستقدمين منكم﴾ وەئێوە چاك بزانن کە ئێمە بەپێشینانی ئێوە: زیندووان مردووانتان دەزانین ﴿ولقد علمنا المستأخرين﴾ و هەروا دەشزانین بە پاشینان ، ئەوانەش لەپاش ئێوەوە دێنە دنیاوە، واتە: خوا زانایەو ئاگاداری تەواوی بونەوەرە، بە ئێوەیشەوە، چ ئەوانەی لەپێشەوەبوون، چ ئەوانە لەئاییندەدا دەبن و دێن ﴿[٢٥] وإن ربك هو يحشرهم﴾ وە بەڕاستیی پەروەردگارت ئەی موحەممەد ﷺ گش ئەوانە کۆ ئەکاتەوە بۆ حیساب و پاداشت و تۆڵە ﴿إنه حكيم عليم﴾ چونکە بەڕاستیی ئەو زۆر کار بەجێیە، زۆریش زانایە.

**ئینسان لە قوڕە ڕەشەی وشك هەڵاتو ئافەرێنراوە:**

﴿[٢٦] ولقد خلقنا الإنسان من صلصال من حمإ مسنون﴾ بێگومان ئێمە ئینسانی یەکەم (ئادەم)مان لە قوڕێکی ترشاوو وشکهەڵاتووی وا دروستکرد کە: هەرکات پەنجەی لێ درابا ئەزرنگایەوە ، پاشان خوا بەتوانایی خۆی گیانی بەبەرا کردو بووبە ئادەم، وەکو لە جێگایەکی تردا بۆ دووپاتی ئەو ڕاستیە دەفەرمویّ: (خلق الإنسان من صلصال كالفخار ، وخلق الجان من مارج من نار) ﴿[٢٧] والجان خلقناه من قبل من نار السموم﴾ لەپێش دروست کردنی ئادەمیشەوە باوك و سەرۆکی جینەکانیشم (ئیبلیس) لەئاگرێکی بڵێسەدارو بەهاڵاو دروستکرد. پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمویّ: ((لماصور الله تعالى آدم ﷺ في الجنة، تركه الله ماشاء أن يتركه، فجعل إبليس يطيف به ينظر ما هو فلما رآه أجوف عرف أنه خلق خلقا لا يتمالك)) (موسلیم). فی البر والصلة (٢٦١١) باب(٣١). واتە: هەر کە خوای جوانکار وێنەو نەخشەی ئادەم پێغەمبەری ﷺ کێشاو چەندە مەیلی بوو لە بەهەشتدا هێشتیەوە، شەیتانیش بەدەوریدا هەر دەهاتو دەچوو، ئەوسا سەیریکرد ناوەوەی بۆش و خاڵی یە، ئیتر زانی ئەوە دروستکراوێکە توانای بەسەر ئارەزووی خۆیدا نابێ و، ئەو دەتوانێ بە ئاسانی هەڵیخەڵەتێنێ.

**فریشتە سوژدە دەبا بۆ ئادەم، ئیبلیس ئیبا دەکات:**

﴿[٢٨] وإذ قال ربك للملائكة﴾ وە بیر بێنە ئەو کاتە پەروەردگارت بەفریشتەکانی گوت: ﴿إني خالق بشرا من صلصال من حمإ مسنون﴾ کە من مرۆڤێ دروست دەکەم لە قوڕێکی ڕەشی گۆڕاوی وشکهەڵاتووی وا کە هەرکات پەنجەی لێ درابا دەنگی دەدایەوە ﴿[٢٩] فإذا سويته﴾ ئینجا هەرکە بەتەواوی ڕێکمخست ﴿ونفخت فيه من روحي﴾ و لەگیانی خۆم ڕۆحم بەبەرا کردوو، بوو بە مرۆڤێکی تەواو خاوەن گیان ﴿فقعوا له ساجدين﴾ ئێوەش (فریشتەکان!) دا وەرنەوەو دەمەو ڕوو سوژدەی بۆ بەرن هەمووتان ﴿[٣٠] فسجد الملائكة كلهم اجمعون﴾ ئینجا فریشتە دەست بەجێ هەموویان بەتێکڕا فەرمانەکەی خوایان بەجێ هێناو کڕنووشی ڕێزو حورمەتیان بۆ ئادەم برد ﴿[٣١] إلا إبليس أبى أن يكون مع الساجدين﴾ شەیتانی گەورە (ئیبلیس) نەبێ، ئەو ملی نەداو، ئیبایکرد لەگەڵ کڕنووش بەران بێت !! چونکە شەیتان وەك خۆی دەڵێ لەئاگرە، فریشتەیش لەنوورە، ئەو هەمیشە سەرپێچی ئەکات، ئەمادیش بەهیچ شێوەیەك نافەرمانی ناکەن، وە بەیەقین وەك زانایان دەڵێن شەیتان لەڕشتەی فریشتە نییە، بەڵکو لەبەر ئەوە کە لە هەموو شوێن و جێگایەکدا لەگەڵیاندا بوو، ئەویش بەر فەرمانەکەی خوا کەوت بۆ سوژدە بردن بۆئادەم (شێخ حەسەنی بەصریی/ خوا لێی ڕازی بێت) ئەڵێ: (والله ما كان إبليس من الملائكة طرفة عين) سوێند بەخوا (ئیبلیس) هیچ کات بەئەندازەی چاو تروکانێکیش فریشتە نەبووە ﴿[٣٢] قال يا إبليس ما لك الا تكون مع الساجدين﴾ خوا

فەرمووی: ئە رێ ئیبلیس ! بۆ چ تۆ لەگەڵ کڕنووشبەران نەبوویت، چی ڕێی لێ گرتیت لە گەڵیان بیت ؟! ﴿[٣٣] قال لم
أكن لأسجد لبشر﴾ شەیتان وتی: هەرگیز بۆمن شایستە نییە کوڕنوش بۆ مرۆیەك بەرم ﴿خلقته من صلصال من
حمإ مسنون﴾ تۆ لەقوڕێکی ترشاوی وشکەهەڵاتوو دروستتکردووە، لە جێگایەکی تردا خوا وتەکەی شەیتان
دەگێڕێتە کە گوتی: (انا خیر منه خلقتنی من نار وخلقته من طین) یان گوتی: (أرأیتك هذا الذی کرمت علی).

**ئیبلیس لەبەهەشت دەردە پەڕێنرێ و تا ڕۆژی سەڵاش ململانێ دەکا:**

﴿[٣٤] قال فاخرج منها فإنك رجيم﴾ خوا فەرمووی سالەنێو فریشتەدا دەرچۆ، چونکە تۆ لای من دەر کراویت ﴿[٣٥]
وإن عليك اللعنة إلى يوم الدين﴾ وەهە تا ڕۆژی پاداشتیش نەفرینت لەسەرە ﴿[٣٦] قال رب فأنظرني إلى يوم
يبعثون﴾ ئیبلیس وتی: ئەی پەروەردگاری من ! مەودام بدە
تاڕۆژێ خەڵکی زیندوو دەکرێنەوە، بۆ ئەوە تۆڵە لەئادەم و
نەوەکانی بکاتەوە ﴿[٣٧] قال فإنك من المنظرين﴾ خوایش
فەرمووی: دەتۆ لە مۆڵەتدراوانیت ﴿[٣٨] إلى يوم الوقت
المعلوم﴾ تا ڕۆژی دیاریکراو بۆ لەناوچوونی هەموو
گیانلەبەران، واتە: ڕۆژی (نەفخەی یەکەم) ﴿[٣٩] قال رب بما
اغويتني﴾ شەیتان وتی: ئەیپەروەردگاری من! بەهۆی
ئەوەوە کە تۆ گومڕات کردم ، واتە: لەسەر سوژدە نەبردن بۆ
ئادەم ﴿لأزينن لهم في الأرض﴾ مەرج بێت منیش گوناح و
لاساری بۆ وەچەو نەوەکانی ئادەم لەزەویدا شیرین کەم ﴿و
لأغوينهم اجمعين﴾ و گشتیشیان لەڕێی ڕاست گومڕاو سەر
لێشێواو بکەم ﴿[٤٠] إلا عبادك منهم المخلصين﴾ مەگین عەبدە
دڵو دەروون پاکەکانت، ئەوانەیان لەبەر هەر حیکمەتێ
خۆت دەیزانیت بڕیارت داوە لەسەر هیدایەت بن ، لە
شوێنێکی دیکەدا هاتووە: (أرایتك هذا الذی کرمت علي لإن
اخرتنی إلى یوم القیامة لاحتنکن ذریته إلا قلیلا) ﴿[٤١] قال هذا
صراط على مستقيم﴾ خوایش فەرمووی: ئەمە ڕێگەی ڕاست
و ڕێکی بەرەو منە، دەرەنجامیش هەموو بۆلای خۆم دێنەوە، هەر کەسەیش بە پێی کارو کردەوەی خۆی پاداش و
تۆڵە وەر دەگرێت، وە لە جێگایەکی تردا هەر لەمەڕ ئەو ڕێبازەی خواوەوە دەفەرموێ: (وعلى الله قصد السبيل) ﴿[٤٢]
إن عبادي ليس لك عليهم سلطان﴾ بێگومانیشبە تۆ هیچ جۆرە دەسەڵاتێکت بەسەر دڵی بەندە ڕاساڵەکانی مندا
نییە، چونکە هەر لەژێر ڕکێفی خۆمدان و لە (ئەزەل)دا بڕیومەتەوە بەدوای تۆدا نایەن ﴿إلا من اتبعك من الغاوين﴾
مەگەر ئەو گومڕاو لاڕێیانەی پەیڕەویی لەتۆدەکەن و، بەدوای تۆدا دەچن ﴿[٤٣] وإن جهنم لموعدهم اجمعين﴾ و
بەڕاستیی دۆزەخیش جێگای ئەوانە هەمووە (واتە: شەیتان و شوێنکەوتووەکانی) لە ئایەتێکی دیکەدا جەخت لە
سەر ئەوە دەکاتەوەو دەفەرموێ: (ومن یکفر به من الأحزاب فالنار موعده).

الجزء الرابع عشر — سورة الحجر

قَالَ يَٰٓإِبۡلِيسُ مَا لَكَ أَلَّا تَكُونَ مَعَ ٱلسَّٰجِدِينَ ٣٢ قَالَ لَمۡ أَكُن لِّأَسۡجُدَ لِبَشَرٍ خَلَقۡتَهُۥ مِن صَلۡصَٰلٖ مِّنۡ حَمَإٖ مَّسۡنُونٖ ٣٣ قَالَ فَٱخۡرُجۡ مِنۡهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٞ ٣٤ وَإِنَّ عَلَيۡكَ ٱللَّعۡنَةَ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ٣٥ قَالَ رَبِّ فَأَنظِرۡنِيٓ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ ٣٦ قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ ٱلۡمُنظَرِينَ ٣٧ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡوَقۡتِ ٱلۡمَعۡلُومِ ٣٨ قَالَ رَبِّ بِمَآ أَغۡوَيۡتَنِي لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَأُغۡوِيَنَّهُمۡ أَجۡمَعِينَ ٣٩ إِلَّا عِبَادَكَ مِنۡهُمُ ٱلۡمُخۡلَصِينَ ٤٠ قَالَ هَٰذَا صِرَٰطٌ عَلَيَّ مُسۡتَقِيمٌ ٤١ إِنَّ عِبَادِي لَيۡسَ لَكَ عَلَيۡهِمۡ سُلۡطَٰنٌ إِلَّا مَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡغَاوِينَ ٤٢ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمَوۡعِدُهُمۡ أَجۡمَعِينَ ٤٣ لَهَا سَبۡعَةُ أَبۡوَٰبٖ لِّكُلِّ بَابٖ مِّنۡهُمۡ جُزۡءٞ مَّقۡسُومٌ ٤٤ إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي جَنَّٰتٖ وَعُيُونٍ ٤٥ ٱدۡخُلُوهَا بِسَلَٰمٍ ءَامِنِينَ ٤٦ وَنَزَعۡنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنۡ غِلٍّ إِخۡوَٰنًا عَلَىٰ سُرُرٖ مُّتَقَٰبِلِينَ ٤٧ لَا يَمَسُّهُمۡ فِيهَا نَصَبٞ وَمَا هُم مِّنۡهَا بِمُخۡرَجِينَ ٤٨ ۞ نَبِّئۡ عِبَادِيٓ أَنِّيٓ أَنَا ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ٤٩ وَأَنَّ عَذَابِي هُوَ ٱلۡعَذَابُ ٱلۡأَلِيمُ ٥٠ وَنَبِّئۡهُمۡ عَن ضَيۡفِ إِبۡرَٰهِيمَ ٥١

إذ دخلوا ٢٦٤

**جەحەنەم حەوت دەرگای هەیە :**

﴿٤٤ لها سبعة أبواب﴾ دۆزەخیش حەوت دەرگای هەیە ﴿لكل باب منهم جزء مقسوم﴾ بۆ هەر دەرگایەکیش دەستەیەك لە پەیڕەوانی شەیتانی بۆ دیاریی کراوە, گومڕاکانیش بەپێی تاوانەکانیان جۆراوجۆرن ، بۆیە هەر بەشەی لە دەرگایەکەوە دەنێردرێتە ناوی!. ئینجا خوای میهرەبان پاشە ڕۆژی پارێزکاران باس ئەکاو ئەفەرمووێ: ﴿٤٥ إن المتقين فی جنات وعیون﴾ بەڕاستیی لە ئاخیرەتدا پارێزکاران لەناو چەندین باخات و لەلای چەندین کانیاوی (شەراب، شیر، هەنگوێن..) دان ﴿٤٦ ادخلوها بسلام آمنین﴾ پێیان دەوترێ: دەسا دوور لەهەموو بەڵاو نەهات و ناخۆشییەك، بەدڵنیاییەوە بچنە ناویانەوە ﴿٤٧ ونزعنا ما فی صدورهم من غل﴾ وە هەر قین و قارو دژایەتییەك هەبێت کە بەهۆی ژیان و ژیواری دونیاوە پەیدا بووبێ لەوێ لە سنگیانی لا دەبەین، واتە: بەسنگێکی پاك و سافەوە، بەدڵێکی خاوێنەوە ﴿إخوانا علی سرر متقابلین﴾ لەبەرامبەر یەکتر بە برایانە لەسەر تەخت دادەنیشن ، کە شێوەی دانیشتنی ئاوا باشترین ڕێزو حورمەتە بۆ یەکتر. پێشەوا (بوخاریی) ئەم فەرموودەیە دەهێنێت و دەڵێت: ((یخلص المؤمنون من النار، فیحبسون علی قنطرة بین الجنة والنار، فیقتص لبعضهم من بعض مظالم کانت بینهم فی الدنیا، حتی إذا هذبوا ونقوا، أذن لهم فی دخول الجنة)) واتە: موسڵمانەکان لە ئاگر ڕزگاریان دەبێ, ئینجا لە نێوان بەهەشت و دۆزەخدا ڕادەگیردرێن، هەر هەقێکیان بەسەر یەکترەوە هەبێت بۆیان جێبەجێ دەکرێت، ئەوسا بەپاك و خاوێنی و بێ ڕك و کینە گشت دەچنە بەهەشتەوە دوای ئیزندان پێیان ﴿٤٨ لا یمسهم فیها نصب﴾ وە لەوێ هیچ ڕەنج و ناڕەحەتیەکیشیان تووشنابێ، لە فەرموودەدا هاتووە: ((أن اللە أمرنی أن أبشر خدیجة ببیت فی الجنة من قصب لاصخب فیه ولا نصب..)) متفق علیه.﴿وماهم منها بمخرجین﴾ و هەرگیزیش ناهێنرێنە دەرێ لێی، چونکە نیعمەتی ئەوێ نەبڕاوەو بەردەوامە، لە فەرموودەیەکدا هاتووە: ((بەبەهەشتییەکان دەگوترێت: مژدە بێت کە: هەمیشە لەشساغ و تەندروستن و نەخۆش ناکەون، بەخۆشیی بژین و ڕابوێرن، ئیتر نامرن، هەر لاوو و شۆخ و شەنگن ، قەت پیر نابن، بەردەوام لێرەن و، هەرگیز جێیناهێڵن)) پێشەوا موسلیم. ﴿٤٩ نبئ عبادی﴾ ئەی موحەممەد ﷺ تۆ بەندەکانم ئاگادار بکە ﴿أنی أنا الغفور الرحیم﴾ کە بەڕاستیی هەر خۆمم زۆر لێبوردە، زۆریش میهرەبان و دلۆڤان ﴿٥٠ وأن عذابی هو العذاب الألیم﴾ و سزاشم سزای زۆر بەژان و ئێش پێگەیەنەرەو وێنەی نیە، بەڵام لێبوردنیشم پێش سزام کەوتووە, بۆیە پێغەمبەری خواش ﷺ دەفەرموێ: ((لو یعلم المؤمن ما عند اللە من العقوبة ما طمع بجنته أحد، ولو یعلم الکافر ما عند اللە من الرحمة ما قنط من رحمته أحد)) موسلیم فی التوبة(٢٧٥٥) باب(٤) واتە: ئەر موسڵمان بزانێت خوا چەندە خاوەن تۆڵەیە، هەر گیز کەسێك بەتەمای بەهەشت نەدەبوو، وە ئەگەر کافریش زانیبای ڕەحم و بەزەیی خوا چەندە زۆرە ، قەت کەسێك لە ڕەحمەتی خوا تەماح بڕ نەدەبوو!.

**باس و خواستی میوانەکانی ئیبراهیم:**

﴿٥١ ونبئهم عن ضیف إبراهیم﴾ ئەی پێغەمبەر ! دەنگ و باسی میوانەکانی ئیبراهیمیان لێ ئاگادار بکە کە: کۆمەڵێ فریشتە بوون و خوا ناردنی بۆ لەناوبردنی قەوم و نەتەوەکەی (لووط)ی ئامۆزای ﴿٥٢ إذ دخلوا علیه﴾ ئەوکاتەی چوونە ژوورێ لای ﴿فقالوا سلاما﴾ و دەست بەجێ وتیان: سەلام لەئیبراهیم ﴿قال إنا منکم وجلون﴾ ئیبراهیمیش "دیارە پاش سلاوسەندنەوە پێیگوتن: بەڕاستیی ئێمە ناتانناسین و لێشتان دەترسین، چونکە کە خێرا چووو خواردنی بۆ هێنان و لێیان نەخوارد، پێی وابوو نەیارن ﴿٥٣ قالوا لا توجل﴾ ئەوانیش وتیان: مەترسە ﴿إنا نبشرك بغلام علیم﴾ بەڕاستیی ئێمە فریشتەین و هاتووین مزگێنی کوڕێکی زانا بەتۆ بدەین، واتە: ئیسحاق/ سەلامی

لەسەربێ ﴿٥٤ قال ابشرتمونی﴾ ئیبراهیم بەسەر سوڕمانێکەوە گوتیی: ئایا موژدەم دەدەنێ ؟ ﴿علی ان مسنی الکبر﴾ لەحاڵێکا پیری زەربەی لێداوم ؟! ﴿فبم تبشرون﴾ جا لەحاڵی ئاوادا کەمن هێندە پیر بم مژدەم بەچی دەدەنێ ﴿٥٥ قالوا بشرناك بالحق﴾ وتیان: بەشتێکی هەق و ڕاست موژدەت دەدەینێ" بۆچی سەرت سوڕ دەمێنێ، واتە: شتەکە ڕاستەو فەرمانی خوایەو بڕاوەتەوە ﴿فلا تکن من القانطین﴾ نابێ تۆیش لەبێ هیوایان بیت ﴿٥٦ قال ومن یقنط من رحمة ربه إلا الضالون﴾ ئیبراهیم وتی: دەبێ کێ لەمیهرەبانی پەروەردگاری خۆی نائومێد بێ، بەدەر لەڕێ لادەرەکان؟ بەڵام لەبەر هێندە پیر بوونم سەرم لەخۆم سوڕ دەمێنێ کە لەحاڵەتی وادا مندالمان ببێت، نەك لەدەسەلاتی خوا، هەتا هیوام بەرەحمەتی خوا نەبێ .

**فریشتەکان بۆچی هاتن ؟**

﴿٥٧ قال فما خطبكم ایها المرسلون﴾ جا دوای ئەوە کە(ئیبراهیم) هێمن دەبێتەوەو ترسی نامێنی دەڵێت: ئەی نێردراوەکان ! دەبێ کاری گرنگتان لەم هاتنەتاندا چی بێت ؟ ﴿٥٨ قالوا إنا ارسلنا إلی قوم مجرمین﴾ وتیان بەڕاستیی لەلای خواوە ناردراوین بۆ لەناوبردنی گەلێکی تاوانبار، واتە: هۆزی لووط ﴿٥٩ إلا آل لوط﴾ خاوو خێزانەکەی لووط نەبێ، چونکە ئەوانە موسڵمانن ﴿إنا لمنجوهم اجمعین﴾ بێگومانیش ئەوانە هەموو ڕزگار دەکەین ﴿٦٠ إلا إمراته﴾ ژنەکەی نەبێت ﴿قدرنا إنها لمن الغابرین﴾ چونکە لەبەر بێ بڕوایی و کلا بوونی لەڕێی هەق، بڕیارمان داوە ئەو لەڕیزی تیاچووەکاندا بێت.

**فریشتەکان دەبنە میوانی لووط:**

﴿٦١ فلما جاء آل لوط المرسلون﴾ ئینجا کە فریشتە ڕاسپاردەکان لەسەرو سیمایەکی جوان و شیریندا هاتنە لای بنەماڵەی لووط ﴿٦٢ قال إنكم قوم منكرون﴾ لووط گوتی: ئێوە کەسانێکن، من ناتانناسم ﴿٦٣ قالوا بل جئناك بما كانوا فیه یمترون﴾ فریشتەکان وتیان: ئێمە پیاوخراپ نین ، دڵنیابە ئێمە فریشتەین و هاتووین بەوەی ئەوان گومانیان تێدایە, واتە: هاتووین سزایەکمان هێناوە کە هۆزەکەت گومانیان لەهاتنیدا هەیە ﴿٦٤ واتیناك بالحق﴾ هاتووین بۆلات بەهەواڵێکی هەق و ڕاست ، وەکو دەفەرموێ: (ماننزل الملائكة إلا بالحق..) ﴿وإنا لصادقون﴾ وەبێگومان بەڕاستمانەو ڕاست بێژین لەقسەکەماندا .

**لووط! شەو ڕەویی بەخاوو خێزانت بکە:**

﴿٦٥ فأسر بأهلك بقطع من الليل﴾ جا کەوایە ئەی لووط ! لە دوای تێپەڕبوونی بەشێك لەشەو خاووخێزانت وەدەرنێ و لەشار بڕۆ ﴿واتبع ادبارهم﴾ خۆیشت شوێنیان بکەوە ﴿ولا یلتفت منكم احد﴾ وە نابێ هیچ کەسێکیشتان بەرەو دوا لابکاتەوە تا ئەو نارەحەتی و سزایە نەبینێ کاتێ دەبارێتە سەریان ﴿وامضوا حیث

سُورَةُ الحِجر — الجُزءُ الرَّابِعَ عَشَر

إِذۡ دَخَلُواْ عَلَيۡهِ فَقَالُواْ سَلَٰمٗا قَالَ إِنَّا مِنكُمۡ وَجِلُونَ ﴿٥٢﴾ قَالُواْ
لَا تَوۡجَلۡ إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَٰمٍ عَلِيمٖ ﴿٥٣﴾ قَالَ أَبَشَّرۡتُمُونِي عَلَىٰٓ أَن
مَّسَّنِيَ ٱلۡكِبَرُ فَبِمَ تُبَشِّرُونَ ﴿٥٤﴾ قَالُواْ بَشَّرۡنَٰكَ بِٱلۡحَقِّ
فَلَا تَكُن مِّنَ ٱلۡقَٰنِطِينَ ﴿٥٥﴾ قَالَ وَمَن يَقۡنَطُ مِن رَّحۡمَةِ
رَبِّهِۦٓ إِلَّا ٱلضَّآلُّونَ ﴿٥٦﴾ قَالَ فَمَا خَطۡبُكُمۡ أَيُّهَا ٱلۡمُرۡسَلُونَ
﴿٥٧﴾ قَالُوٓاْ إِنَّآ أُرۡسِلۡنَآ إِلَىٰ قَوۡمٖ مُّجۡرِمِينَ ﴿٥٨﴾ إِلَّآ ءَالَ لُوطٍ
إِنَّا لَمُنَجُّوهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٥٩﴾ إِلَّا ٱمۡرَأَتَهُۥ قَدَّرۡنَآ إِنَّهَا لَمِنَ
ٱلۡغَٰبِرِينَ ﴿٦٠﴾ فَلَمَّا جَآءَ ءَالَ لُوطٍ ٱلۡمُرۡسَلُونَ ﴿٦١﴾ قَالَ
إِنَّكُمۡ قَوۡمٞ مُّنكَرُونَ ﴿٦٢﴾ قَالُواْ بَلۡ جِئۡنَٰكَ بِمَا كَانُواْ فِيهِ
يَمۡتَرُونَ ﴿٦٣﴾ وَأَتَيۡنَٰكَ بِٱلۡحَقِّ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴿٦٤﴾ فَأَسۡرِ
بِأَهۡلِكَ بِقِطۡعٖ مِّنَ ٱلَّيۡلِ وَٱتَّبِعۡ أَدۡبَٰرَهُمۡ وَلَا يَلۡتَفِتۡ مِنكُمۡ أَحَدٞ
وَٱمۡضُواْ حَيۡثُ تُؤۡمَرُونَ ﴿٦٥﴾ وَقَضَيۡنَآ إِلَيۡهِ ذَٰلِكَ ٱلۡأَمۡرَ أَنَّ
دَابِرَ هَٰٓؤُلَآءِ مَقۡطُوعٞ مُّصۡبِحِينَ ﴿٦٦﴾ وَجَآءَ أَهۡلُ ٱلۡمَدِينَةِ
يَسۡتَبۡشِرُونَ ﴿٦٧﴾ قَالَ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ ضَيۡفِي فَلَا تَفۡضَحُونِ ﴿٦٨﴾ وَٱتَّقُواْ
ٱللَّهَ وَلَا تُخۡزُونِ ﴿٦٩﴾ قَالُوٓاْ أَوَلَمۡ نَنۡهَكَ عَنِ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٧٠﴾

٢٦٥

تؤمرون﴾ وە بۆ ئەو شوێنە کە فەرمانتان پێکراوە لە وڵاتی (شام) کە بۆی بچن، ڕێبگرنە بەر ﴿٦٦ وقضينا إليه ذلك الأمر﴾ وە ئەو بڕیارە گرنگ و گەورەیەمان سروش بۆ کرد ﴿أن دابر هؤلاء مقطوع مصبحين﴾ کە بەڕاستیی لە دەمی بەرەبەیاندا ڕەگ و ڕیشەی هەموو ئەمانە لەبن دەردێ و، ئەبێ هیچ کەسێکیان لێ دەر نەچێت، وەك لەئایەتی تردا دەفەرموێ: (إن موعدهم الصبح أليس الصبح بقريب). یان ئەفەرموێ: (فقطع دابر القوم الذين ظلموا والحمد لله رب العالمين).

**خەڵکی شار بەهەلهەلە سەریان هەڵدا:**

﴿٦٧ وجاء أهل المدينة يستبشرون﴾ وەهەر کەخەڵکی شارەکەی (سدوم) بیستیان وا لووط میوانی هاتووە، کەوتنە هەلهەلە کێشان و، لەخۆشیا مژدەیان بەیەکدی دەدا بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە زۆر دزێوو قێزەون و ناشیاوەیان !! ﴿٦٨ قال إن هؤلاء ضيفي فلا تفضحون﴾ جا لەبەر ئەوە کەلووط نەیزانیبوو ئەوانە فریشتەن، ترسی هەبوو بێ حورمەتیان بکەن، بۆیە وتی: بەڕاستیی ئەوانە میوانی منن، تکاتان لێ دەکەم ڕوو زەردم مەکەن و ئابڕووم مەبەن لایان ﴿٦٩ واتقوا الله ولا تخزون﴾ لەخوا بترسن و، شەرمەندەو چاوشۆڕم مەکەن ، جا لەباتی ئەوە هۆزەکەی بەگوێی بکەن ﴿٧٠ قالوا أو لم ننهك عن العالمين﴾ وتیان: ئایا پێمان نەگوتیت نابێ کەس تخونت کەوێ و میواندری خەڵکان بکەیت ؟ واتە: بە گوێمان ناکەیت و ڕێگریشمان دەکەیت لە ئەنجامدانی کارەکەمان؟ ﴿٧١ قال هؤلاء بناتي إن كنتم فاعلين﴾ لووتیش لەناچاریا وتی: کورە غیرەتتان بێت" ئەمانە کچەکانمن، لێتان مارە ئەکەم، ئەگەر هەر نیازی ئەوکارەتان کردووە، تکایە بگەڕێنەوە سەر فیترەتی پاك و خاوێن، وە لەو بەد ئەخلاقییە لادەن. ڕاڤەکرانی قورئان دەڵێن: مەبەست لە وشەی (بناتي) کیژۆڵەو کچانی هۆزو

---

سُورَةُ الحِجۡرِ — الجزء الرابع عشر

قَالَ هَٰٓؤُلَآءِ بَنَاتِيٓ إِن كُنتُمۡ فَٰعِلِينَ ﴿٧١﴾ لَعَمۡرُكَ إِنَّهُمۡ لَفِي سَكۡرَتِهِمۡ
يَعۡمَهُونَ ﴿٧٢﴾ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلصَّيۡحَةُ مُشۡرِقِينَ ﴿٧٣﴾ فَجَعَلۡنَا عَٰلِيَهَا
سَافِلَهَا وَأَمۡطَرۡنَا عَلَيۡهِمۡ حِجَارَةٗ مِّن سِجِّيلٍ ﴿٧٤﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ
لَأٓيَٰتٖ لِّلۡمُتَوَسِّمِينَ ﴿٧٥﴾ وَإِنَّهَا لَبِسَبِيلٖ مُّقِيمٍ ﴿٧٦﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ
لَأٓيَةٗ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٧٧﴾ وَإِن كَانَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡأَيۡكَةِ لَظَٰلِمِينَ ﴿٧٨﴾
فَٱنتَقَمۡنَا مِنۡهُمۡ وَإِنَّهُمَا لَبِإِمَامٖ مُّبِينٖ ﴿٧٩﴾ وَلَقَدۡ كَذَّبَ أَصۡحَٰبُ
ٱلۡحِجۡرِ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿٨٠﴾ وَءَاتَيۡنَٰهُمۡ ءَايَٰتِنَا فَكَانُواْ عَنۡهَا مُعۡرِضِينَ
﴿٨١﴾ وَكَانُواْ يَنۡحِتُونَ مِنَ ٱلۡجِبَالِ بُيُوتًا ءَامِنِينَ ﴿٨٢﴾ فَأَخَذَتۡهُمُ
ٱلصَّيۡحَةُ مُصۡبِحِينَ ﴿٨٣﴾ فَمَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴿٨٤﴾
وَمَا خَلَقۡنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَآ إِلَّا بِٱلۡحَقِّۗ وَإِنَّ
ٱلسَّاعَةَ لَأٓتِيَةٞۖ فَٱصۡفَحِ ٱلصَّفۡحَ ٱلۡجَمِيلَ ﴿٨٥﴾ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ
ٱلۡخَلَّٰقُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٨٦﴾ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَٰكَ سَبۡعٗا مِّنَ ٱلۡمَثَانِي وَٱلۡقُرۡءَانَ
ٱلۡعَظِيمَ ﴿٨٧﴾ لَا تَمُدَّنَّ عَيۡنَيۡكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعۡنَا بِهِۦٓ أَزۡوَٰجٗا مِّنۡهُمۡ
وَلَا تَحۡزَنۡ عَلَيۡهِمۡ وَٱخۡفِضۡ جَنَاحَكَ لِلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٨٨﴾ وَقُلۡ إِنِّيٓ
أَنَا ٱلنَّذِيرُ ٱلۡمُبِينُ ﴿٨٩﴾ كَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَى ٱلۡمُقۡتَسِمِينَ ﴿٩٠﴾

ٱلَّذِينَ جَعَلُواْ — ٢٦٦

---

قەومەکەیەتیی، چونکە هەموو پەیامبەرێك باوکی میللەتەکەی خۆیەتی ﴿٧٢ لعمرك إنهم لفي سكرتهم يعمهون﴾ خوا ئەفەرموێ: دە بەگیانی تۆ قەسەم ئەی موحەممەد ﷺ! ئەوانە لەگێژاوی مەستیی وبێ هۆشیی و سەر لێشێواوی خۆیاندا یارییان دەکردو بەیەکدا دەهاتن ، چونکە ئاگایان لێ نەبوو بەیانی چییان لێدێ..!!. (عەبدوڵڵای کوڕی عەباس) دەڵێت: خوا هیچ ڕێزدارێکی تری وەك موحەممەد ﷺ دروست نەکردووەو، نەشم بیستووە کە سوێند بەگیان و ژیانی هیچ کەسێك بخوات، جگە لە پەیامبەر ﷺ. ڕاڤەکەرانی قورئانیش بەکۆی دەنگ دەڵێن: خوا لەو ئایەتەدا سوێندی بەگیان و ژیانی پێغەمبەر خوارد !! دیارە ئەمە بەڵگەیە لەسەر گەورەیی و مەزنایەتی پێغەمبەر، وە شتێکی تر جگە لەمە ناگەیەنێت, وەك شەرعیەتدان بە سوێند خواردن بە غەیرەز خوا، چونکە خوا سوێن بە گەلێ لە دروستکراوەکانی دەخوا، بەڵام بۆ ئێمە ڕەوانیە سوێندیان پێ بخۆین.

### لەگەڵ گزنگی هەتاودا خوا گرتنی:

﴿٧٣ فأخذتهم الصيحة مشرقين﴾ ئینجا لەگەڵ گزنگی خۆردا شریخەو دەنگی فریشتە، یان هەرشریخەیەکی تر گرتنیی و، لاپەڕەی ژیانیان پێچرایەوە ﴿٧٤ فجعلنا عاليها سافلها﴾ بەو شێوە کەخانووەکانیانمان ژێرو ژوور کرد ﴿وأمطرنا عليهم حجارة من سجيل﴾ وە بە (گڵبەرد) بەردە بارانمانکردن ﴿٧٥ إن فى ذلك لآيات للمتوسمين﴾ بەڕاستیی لەو سزاو تۆڵەدا زۆر بەڵگەو نیشانە هەیە بۆ ئەوانەی پەندو ئامۆژگاری وەر بگرن و، یان ورد دەبنەوە، جا هەر بۆ دووپاتی ئەو مانایەو دەرك و زیرەکی مرۆی ئیماندار ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((إتقوا فراسة المؤمن فإنه ينظر بنور الله)) پاشانیش ئایەتی: (إن فى ذلك لآيات للمتوسمين)ی خوێندەوە. الترمذى. (فى تفسير القرآن (٣١٣٧) باب (١٦) من سورة الحجر. وفى سنده عطية العوفى وهو ضعيف جدا، وقد أخرجه الشوكانى فى الفوائد المجموعة فى الأحاديث الموضوعة..) ئەمەو هەندێ لێکۆڵینەوەی تری لەسەرە، دەتوانی تەماشای تەفسیری (قورتبی/ بەرگی/٥ پەراوێزەکەی بکەیت. ﴿٧٦ وإنها لبسبيل مقيم﴾ و بەڕاستی ئێستاش گوندو شارە وێرانکراوەکان لەسەر ڕێگەی کاروانەکاندایە لەوڵاتی (شام)، هەر بەپێوە ماونەتەوەو دەبینرێن و، بوونەتە دەریاچەیەکی بۆگەن و پیس، وەکو دەفەرموێ: (وإنكم لتمرون عليهم مصبحين ، وبالليل أفلا تعقلون) ﴿٧٧ إن فى ذلك لآية للمؤمنين﴾ بەڕاستیی لەو دەست وەشانەدا نیشانەیەکی گەورەی دەسەڵاتی خوا هەیە بۆ بڕواداران.

### یارانی بێشەیش (أصحاب الأيكة) لەناو چوون:

﴿٧٨ وإن كان أصحاب الأيكة لظالمين﴾ و بەڕاستیی (أصحاب الأيكة) خاوەن بێشەکان، واتە: گەلەکەی (شوعەیب) بڕوایان بەشوعەیب نەهێناو ستەمکارو لەسەر ناهەق بوون.(**ئەیکە**/ بەجێگایەکی پڕ لەدار و درەخت دەڵێن) ﴿٧٩ فانتقمنا منهم﴾ ئێمەیش لەبەرامبەر ئەوەوە تۆڵەمان لێ سەندن، هەورە تریشقەو بوومە لەرزە گرتنی و، بوونە قوربانی لاساری خۆیان ﴿وإنهما لبإمام مبين﴾ کە بەڕاستیی هەردووکیان شارو گوندە وێراو کراوەکانی نەتەوەکەی (لووط) و، هۆزەکەی (شوعەیب) لەسەرە ڕێگایەکی ئاشکرادان و دەبینرێن ، ڕێبواران هەمووکات بەلایاندا تێپەڕ دەکەن و ئاسەواریان دیارەو دەبینرێت ، ئەوەی خاوەن ئیمان و خاوەن هۆش بێ پەندیان لێ وەردەگرێ، ئەی ئێوە بۆ پەندی لێ وەرناگرن ئەی قورەیش؟

### خەڵکی حیجریش (سەموود) تیاچوون:

﴿٨٠ ولقد كذب أصحاب الحجر المرسلين﴾ وبەڕاستیی خەڵکی شاری (حیجر)یش - نەتەوەکەی صاڵح کە لەنێوان (مەدینە)و (شام)دایە- پەیامبەرانیان بەدرۆزن دانا، واتە: باوەڕیان بە صاڵح پێغەمبەر نەکرد، ئەمەش وەکو ئەوە وایە باوەڕیان بەهەموو پێغەمبەران نەکردبێ. ﴿٨١ وآتيناهم آياتنا﴾ جا لەگەڵ ئەوەیشدا چەندین بەڵگەو نیشانەی دەسەڵاتی خۆشمان نیشاندان، وەکو وشترەکەو، بیرەکە ، بەڵکو باوەڕ بهێنن ﴿فكانوا عنها معرضين﴾ کەچی هەر بێزارییان دەربڕی و ڕوویان لەو گشت موعجیزەو ئایەتانە وەرگێڕا! ﴿٨٢ وكانوا ينحتون من الجبال بيوتاً آمنين﴾ وە ئەوان هۆزێکی وابوون لە چیاکاندا، خانوویان بۆ ئارەزووو خۆشیی دەتاشیی و، تیایاندا بەئاسوودە دەژیان ﴿٨٣ فأخذتهم الصيحة مصبحين﴾ هەتا لەئەنجامی بێ دینی خۆیاندا، لە بەرە بەیانێکی زوودا سزاو دەنگی وێرانکەریان هاتە سەرو گرتنیی و تیاچوون ، لە فەرموودەدا هاتووە: هەر کە پێغەمبەر ڕێیکەوتبا ئەو شوێنانە بەهاوەڵەکانی دەگوت: لەم جۆرە شوێنانەدا بەزۆریش بووبێت دەبێ بگرین، نە وەکو سزاکەی ئەوانتان

ئەوقەببێت. پێشەوا ئەحمەد ﴿ [٨٤] فما اغنى عنهم ماكانوا يكسبون﴾ هەرچیشیان کرد بەر لەهاتنی سزاکە، بێ نیازی نەکردن و رزگاریان نەبوو، جا کەواتە ئەی ملهوورەکان! ئێوەیش بیرێ بکەنەوەو فریای خۆتان بکەون !.

**قیامەت بەرێوەیەو هەر دێت:**

﴿ [٨٥] وما خلقنا السموات والأرض وما بينهما إلا بالحق﴾ ئاسمانەکان و زەویی و هەرچیش لەنێوانیاندایە، بەدادگەرانەو راستیی دروستمانکردوون ﴿وإن الساعة لآتية﴾ وە بێگومان ڕۆژو ساتی قیامەتیش لەهاتندایەو، هەر پێش دێت ، لەسوورەتی(مؤمنون)دا دەفەرموێ: (أفحسبتم أنما خلقناكم عبثا وأنكم إلينا لاترجعون) ﴿فاصفح الصفح الجميل﴾ جا تۆش ئەی پێغەمبەر ﷺ! بەشێوەیەکی چاك و جوان چاوپۆشی لە هۆزەکەت بکە, واتە: تاکاتی خۆی دێت و مۆڵەتت بە جەنگ و کوشتار دەدرێ لە گەڵیان ﴿ [٨٦] إن ربك هو الخلاق العليم﴾ چونکە هەرپەروەردگاری تۆیە هەمیشە دروستکەرو بەدیهێنەرە، بەئاگاو زانایە بەهەموو کاروکردەوەیەك وەهەر کات بییەوێ زۆر بەئاسانی قیامەت دێنێت.

**فەرمان بە پێداگری لەسەر بانگەوازەکەی:**

﴿ [٨٧] ولقد آتيناك سبعا من المثاني﴾ و بێگومان ئێمە حەوت ئایەتەکەی سوورەتی فاتیحە کەچەند جارێ لەنوێژدا دەخوێندرێتەوەو دووپات دەکرێتەوە– وەهەروا ئەم قورئانە گەورەیەشمان پێدایت، کە تەواوکەری گشت کتێبە ئاسمانیەکانەو، هەموو هەواڵ و بریارێکی گرنگی تێدایە, لەفەرموودەیەکیشدا بۆ دووپاتی ئەوە هاتووەو دەفەرموێ: ((الحمد لله رب العالمين هي السبع المثاني والقرآن العظيم)) ﴿ [٨٨] لا تمدن عينيك إلى ما متعنا به أزواجا منهم﴾ ئەی پێغەمبەر! چاو مەبرە لەو لەزەت و خۆشیەی هەندێ لەو بێ بڕوایانەمان پێ بەهرەمەند کردووە، چونکە ئەو قورئانەی بەتۆمان داوە زۆر گەورەو بەڕێز ترە، لەوەی بەوانمان داوە ﴿ولا تحزن عليهم﴾ و خەفەتیشیان بۆ مەخۆ کەبڕوا ناهێنن ﴿واخفض جناحك للمؤمنين﴾ ئەوان وێڵ بکەو باڵی بەزەیی ومیهرەبانیت بۆ بڕواداران دابخە، واتە: لەگەڵیاندا بەسۆزبەو لەخۆیشت نزیکیان بکەوە، لەسوورەتێکی دیکەدا هاتووەو دەفەرموێ: (واخفض جناحك لمن اتبعك من المؤمنين).

**کاری پێغەمبەر ترساندنە:**

﴿ [٨٩] وقل إني أنا النذير المبين﴾ بڵێ: من تەنها ترسێنەری ئاشکرام ، لەوە بەولاوە هیچم بەدەست نییەو، هەرکەسێك باوەڕ نەکات، ئەوا وەکو گەلانی پێشوو گیرۆدە دەبێت ﴿ [٩٠] كما أنزلنا على المقتسمين﴾ (ئەبوو سعوود) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێ: هەر چۆنێ قورئانمان دابەزاندە خوارەوە بۆتۆ ئەی پێغەمبەر!، هەر ئاواش لەسەردەمی رابوردوودا کتێبمان ناردووە بۆ سەر ئەوجوولەکەو گاورانەش سوێندیان خواردبوو پێکرا دژایەتی پێغەمبەرەکانیان بکەن ﴿ [٩١] الذين جعلوا القرآن عضين﴾ ئەوانەیان قورئانیان بەشبەشکرد, واتە: باوەڕیان بە هەندێکی کردو, بە هەندێکی باوەڕیان نەکرد, هەر وەکو کتێبەکانی سەردەمی خۆیانیان بەشبەشکردو، باوەڕیان بە هەندێکی کردو، هێندێکیان خستە ئەولاوە. پێشەوا (بوخاریی) لە (ئیبن عەباس)ـەوە دەڵێ: ئەوانەی قورئانیان بەشبەش کرد خاوەننامەکان بوون , ئەوانبوون باوەڕیان بەهەندێکی هێناو, باوەڕیان بە هەندێکی نەهێنا! ﴿ [٩٢] فوربك لنسئلنهم أجمعين﴾ سوێند بەپەروەردگارت ئەی موحەممەد! ﷺ لەهەمووان دەپرسین ﴿ [٩٣] عما كانوا يعملون﴾ لەو کاروکردەوەیە دەیانکردو، چۆنیش وەڵامی پێغەمبەرەکانیان دەدایەوە؟

**سپاردەکەت بە ئاشکرا رابگەیەنە:**

﴿[٩٤] **فاصدع بما تؤمر**﴾ جا تۆیش ئەی پێغەمبەر! هەرچیت پێ سپێردراوە بێ پەردەو بەئاشکراو نمایان دەری برەو، واتە: ڕوو بەڕوو بەمەردمی ڕا بگەیەنەو، ئایینەکەت ئاشکرا بکە ﴿**وأعرض عن المشركين**﴾ و لە هاوبەشدانەران ڕوو وەرگێڕەو گوێیان مەدەرێ و. ئیبن عەباس ئەڵێ: ئەم ئایەتەی ئێرە بەئایەتی: (فاقتلوا المشركين)ـەی (تەوبە) نەسڕاوەتەوە، بەڵکو ئەمیش بۆکات و ساتی خۆی کاری پێ دەکرێ ﴿[٩٥] **إنا كفيناك المستهزئين**﴾ چونکە بەڕاستیی ئێمە لەبەرابەر گاڵتەکەراندا بۆ تۆ بەسین و ناهێڵین کارەکەت ڕاگرن، خوای گەورە لەجێگایەکی تردا بەرامبەریان دەفەرموێ: (ودوا لو تدهن فيدهنون)٩/٦٨. یان دەفەرموێ: (.. والله يعصمك من الناس..) ﴿[٩٦] **الذين يجعلون مع الله إلها آخر**﴾ ئەوانەی کە لەگەڵ خوادا پەرستراوێکی تر دادەنێن ﴿**فسوف يعلمون**﴾ لەدواییدا چاك ئەزانن چییان پێ دەکەین، ئەوەبوو هەر لەڕۆژی (بەدر)دا خوا ڕیسوای کردن و ئابڕووی بردن و، پۆزەی لووتبەرزەکانی شکاند، ئێستایش هەر کەسێك شەریك بۆ خوا دابنێ و، گاڵتەو مەسخەرە بەدینی خوا بکات، خوای گەورە خۆی خەمی دەخوات و بەرووا دەیدا بەزەوییدا.

**تاهەق سەرنەکەوێ کۆڵ نەدەیت:**

﴿[٩٧] **ولقد نعلم أنك يضيق صدرك بما يقولون**﴾ وە بەڕاستیی ئێمە دەزانین کە تۆ لەقسەی ناپەسەندی ئەوانە سنگ و دڵت تەنگ دەبێ، خەریکە نەتوانی کارەکەت بکەیت ﴿[٩٨] **فسبح بحمد ربك**﴾ جا تۆیش بۆلابردنی ئەو ناڕەحەتیی و دڵتەنگییە هەر شوکری پەروەردگاری خۆت بکە ، بەپاك و خاوێن ڕای بگرەو ڕوو لەنوێژ بنێ ﴿**وكن من الساجدين**﴾ و هەردەم لە کڕنووشبەرانبە . پێشەوا (ئەحمەد) ئەم فەرموودە (قودس)یەی هێناوە کە خوا دەفەرموێ : ((ياابن آدم ! لاتعجز عن اربع ركعات أول النهار أكفك آخره)) واتە: ئەی نەوەی ئادەم! تۆ لەسەرەتای ڕۆژەوە چوار ڕکات نوێژ بکە ، بۆ کۆتایی ڕۆژیش خۆمت بەسە ﴿[٩٩] **واعبد ربك حتى يأتيك اليقين**﴾ و هەمیشە پەروەردگاری خۆت بپەرستە، تا ئەوکاتە یەقین (مەرگ)ت بۆدێ . (موجاهید)و(قەتادە..) دەڵێن: پێشەوا (بوخاریی)ش وشەی (یەقین)ی هەر بەمەرگ تەفسیرو مانا کردۆتەوە. واتە: هەتا ئەو ڕۆژە دەمریت ، هەر لەسەر دینبەو کلا مەبە .

**تێبینی:** تاقمێ لەوانە کە بەباشی لەئایینی خوا حاڵی نەبوونەو خۆیان لەڕاستیەکان لادەدەن دەڵێن: مرۆڤ تائەو کاتە خوا پەرستیی لەسەرە کە بەتەواوی خوای بەبەزەیی دەناسێ، جاپاش ئەوە، ئیدی نەنوێژی لەسەر دەمێنێ و، نەهیچ فەرزو واجیباتێکی تر! دەسا تۆش دڵنیابە ئەی خوێنەری هێژا ! کە تەفسیری پڕ بەپڕیی ئەم ئایەتە هەر ئەوەیە ئێمە بۆمان کرد.

الجزء الرابع عشر — سورة النحل

ٱلَّذِينَ جَعَلُوا۟ ٱلْقُرْءَانَ عِضِينَ ﴿٩١﴾ فَوَرَبِّكَ لَنَسْـَٔلَنَّهُمْ
أَجْمَعِينَ ﴿٩٢﴾ عَمَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٩٣﴾ فَٱصْدَعْ بِمَا تُؤْمَرُ وَأَعْرِضْ
عَنِ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٩٤﴾ إِنَّا كَفَيْنَٰكَ ٱلْمُسْتَهْزِءِينَ ﴿٩٥﴾ ٱلَّذِينَ
يَجْعَلُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٩٦﴾ وَلَقَدْ نَعْلَمُ
أَنَّكَ يَضِيقُ صَدْرُكَ بِمَا يَقُولُونَ ﴿٩٧﴾ فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَكُن
مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٩٨﴾ وَٱعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأْتِيَكَ ٱلْيَقِينُ ﴿٩٩﴾

سُورَةُ النَّحْلِ — ترتيبها ١٦ — آياتها ١٢٨

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

نصف الحزب ٢٧
أَتَىٰٓ أَمْرُ ٱللَّهِ فَلَا تَسْتَعْجِلُوهُ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ
﴿١﴾ يُنَزِّلُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ بِٱلرُّوحِ مِنْ أَمْرِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦٓ
أَنْ أَنذِرُوٓا۟ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱتَّقُونِ ﴿٢﴾ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ تَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٣﴾ خَلَقَ
ٱلْإِنسَٰنَ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ ﴿٤﴾ وَٱلْأَنْعَٰمَ
خَلَقَهَا لَكُمْ فِيهَا دِفْءٌ وَمَنَٰفِعُ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ
﴿٥﴾ وَلَكُمْ فِيهَا جَمَالٌ حِينَ تُرِيحُونَ وَحِينَ تَسْرَحُونَ ﴿٦﴾

٢٦٧

لە (١٤١٦/١/١) کۆچی بەرامبەر بە (١٩٩٥/٥/٣١) زایینی لە تەفسیری ئەم سوورەتە بوومەوە.

(والحمدلله رب العالمین).

*** *** ***

## ١٦- سوورەتی ( نەحل )ـە

## مەککەییەو ( ١٢٨ ) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

* ئەم سوورەتە بناغەو بنەما سەرەکییەکانی ئیسلام باس دەکات، وەکو خوایەتیی خوای تاک وتەنیا، وەحی و نیگا، زیندووبوونەوەو پاداشت و تۆڵە. لەپاڵ ئەمانەیشدا گەلێ بەڵگەی جۆراوجۆر دێنێتەوە لە ئاسمان و زەویی، لە دەریاو، لە کێوەکان ، لە دەشت و شیوو دۆڵەکان ، لێزمەی باران و، شینبوونی ڕووەك و گژوگیاو، گەمیی و کەشتیەکان، ئەستێرەکان، کە لە تاریکیەکانی شەودا، ڕێبواران بەتایبەتیی سوودیان لێی وەردەگرن و، ڕێیان پێ دەردەکەن، ئەمانەو چەندین دیمەنی تر کە مرۆڤ بەچاوی سەر ئەیانبینێ و بەگوێ دەیانبیسێت.. باس لەمانە دەکات بۆ دۆزینەوەی خواو بەیەك زانینی ئەو.

* لە سەرەتاوە باسێکی سروش و نیگا دەکات، کە جێگای لاقرتیی بێ باوەڕان بوو و بڕوایان پێ نەکردو، هاتنی قیامەتیشیان بەشتێکی زۆر دوور لە قەڵەم دەدا.. تەنانەتیی ئەوەندەیش نەفام بوون ئەیانوت: جا ئەگەر ڕاستە قیامەت دێت دە فەرموو بۆمان بێنە !! تا دواتر بکەوتایە زیاتر گاڵتەیان دەکرد...!

* سوورەتەکە زیاتر تیشك دەخاتە سەربنەمای یەکتاپەرستیی.. بۆیە ڕوودەکاتە مرۆڤەکانو پێیان دەڵێت: هەرکەسە بەپێی دەسەڵاتی خۆی بازیریی خۆی بخاتە گەڕ بۆ دۆزینەوەی خوا، بەتایبەت سەرێك بەرزەوەکەنو دروستکراوە ڕەنگاو ڕەنگ و نەخشینەکانی ئەو ببینن لەم بوونەوەرە فراوانەدا.

* مرۆڤەکان بەگشتیی دادەچڵەکێنێ لە دەرەنجامی سپڵەیی و بێ باوەڕییان سەبارەت بە نیعمەتەکانی خوای گەورە، دەشیانترسێنێ لەپاشە ڕۆژێکی ڕەشو نەگریس، ئەگەر درێژە بەو بیرو بۆچونە هەڵەیان بدەن.

* لە کۆتاییدا فەرمان بە پەیامبەر ﷺ دەکات کە زۆر بە حیکمەت و وردبینانە خەڵکی بانگ بکات بۆلای دینی خوا، وەلەگەڵیاندا هەمیشە وشەی جوان و شیرین بەکاربێنێ.. لە هەمان کاتیشدا دەبێ زۆر لێبوردەو بە ئارامو خۆگر بێت لەسەر ئەو ئەزیەت و ئەشکەنجەیە لە پێناوی بیرو باوەڕەکەیدا دەدرێ: (ادع إلى سبيل ربك بالحكمة والموعظة الحسنة..) هەتا (واصبر وماصبرك إلا بالله).

### هاتنی قیامەت نزیکە :

﴿بسم الله الرحمن الرحيم* [١] اتى امر الله﴾ ئەوا فەرمانی خوا بۆ سزای بێ باوەڕان هات و گەیشت و قیامەت بەرپا بوو، بەڵێ چونکە قیامەت هەر لە هاتندایەو سەرئەنجامیش (هەر پێشدێت) خوای گەورە بە کرداری ڕابووردوو (ماضی) وشەی (اتی) ی هێنا، هەر وەك لە جێیتردا هەر لەو بارەیەوە دەفەرموێ: (إقترب للناس حسابهم وهم فى غفلة معرضون)١/٢١. یان دەفەرموێ: (إقتربت الساعة وانشق القمر). ﴿فلا تستعجلوه﴾ جا کەوایە پەلەی ئەو ڕۆژە مەکەن ، بێگومانبن هەردێت ، پێغەمبەریش دەفەرموێ: بەر لەهاتنی کات و ساتی قیامەت لەلای خۆرئاواوە پەڵە هەورێکی ڕەش وەکو (مەتاڵە) پەیدا دەبێت ، بەردەوام بەرەو ئاسمان بەرز دەبێتەوەو هەڵدەکشێت، ئەوسا جاڕچییەك لەناو هەورە ڕەشەکەدا دەڵێت: ئەی خەڵکینە ! ئەوجا خەڵکەکە بەرەو یەکدی دێن، ئەویش دەڵێت: ئەرێ گوێتان لێوە

بوو؟ هەیانە دەڵێ: بەڵێ، هەیشیانە دوودڵە، بۆجاری دووەم هاوار دەکاتەوە: ئەرێ بیستان ؟ خەڵکەکەش دەڵێن ، بەڵێ، جابۆ جاری سێیەم دەڵێ: خەڵکینە ! هوشیار بن! وابڕیاری خوا هات بۆهاتنی قیامەت، پەلە مەکەن و بەرێوەیە ، ئەوجا پێغەمبەر فەرمووی: سوێندم بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە! ئەوەندە بەپەلە دێت ، ئەودووکەسە کە پارچە قوماشێکیان راخستبێت، فریای کۆ کردنەوەی ناکەون، ئەوپیاوەی (حەوز)و قومی چاك کردووە بۆ ئاوە خۆرەی ئاژەڵەکەی، مۆڵەتی نابێت ئاویانی تیا بدات، ئەو پیاوەی وشترەکەی دۆشیوە بیخواتەوە، فریای خواردنەوەی ناکەوێت، ئیتر خەڵکیی بەگشتیی سەر قاڵن، هەر یەکە بەدەردی خۆیەوە. ﴿سبحانە وتعالى عما يشركون﴾ پاك و خاوێنیی و، بەرزیی و بڵندیی هەمیشە بۆ خوا لەو شتانەی وا ئەوانە دەیکەنە هاوبەشیی و هاوەڵیی و، زیاد لەوەش کە دەڵێن ناتوانێ قیامەت بێنێ !.

**فریشتە تاك و تەنیایی خوا دەچەسپێنن :**

﴿[٢] ينزل الملائكة بالروح من أمره على من يشاء من عباده﴾ خوا بەفەرمانی خۆی فریشتەی وەحی (جبريل) بەسروش و وەحیەوەو بە فەرمانی پەیامبەریەتیی، دەنێرێ بۆ سەر هەرکەسێك لە بەندەکانی کە خۆی بیەوێ و بەشیاوی بزانێت. ئەم ئایەتە ڕەتی قسەی ئەوانەیە کە خوا لەسەر زاریانەوە دەفەرموێ: (لولا نزل هذا القرآن على رجل من القريتين عظيم)٤٣/٣١. یان لە جێگەیەکی تردا دەفەرموێ: (الله يصطفى من الملائكة رسلا ومن الناس ..) یان دەفەرموێ: (..الله أعلم حيث يجعل رسالته ..)﴿أن انذروا انه لا إله إلا انا﴾ وەحییان بۆ دەکاو پێیان دەڵێ: کە خەڵك لەسزا بترسێنن و، ئاگاداریان بکەن کە جگە لە من هیچ پەرستراوێك بەهەق نییە ﴿فاتقون﴾ جا کەواتە لەسنوورەکانم پارێز بکەن و، قسەم مەشکێنن ﴿[٣] خلق السموات والأرض بالحق﴾ خوا دەسەڵاتدارێکی وایە کە ئاسمانەکان و زەویی بەڕاست و بەهەق بەدیهێناوە، نەك بێهوودەو هەوانتە، لەجێگایەکی تردا دەفەرموێ: (ليجزى الذين أساؤا بما عملوا ويجزى الذين أحسنوا بالحسنى) ئیدی چۆن هاوبەشی بۆ دابنێن ؟! ﴿تعالى عما يشركون﴾ بەرزو بڵندە لەو بتانەی کە ئەوان ئەیانکەنە هاوبەشیی و، دەسەڵاتی هیچ شتێکیشیان نیە.

**ئاسمان و زەویی و مرۆ هەر خوا دایهێناون :**

﴿[٤] خلق الإنسان من نطفة﴾ ئەو مرۆڤەی لە تنۆکە ئاو (تۆم)ێکی کەم و لاواز دروستکرد ﴿فإذا هو خصيم مبين﴾ کەچی لەباتی باوەڕهێنان، بوویە دوژمنێکی ئاشکراو ململانێکەر لەگەڵ دروستکارەکەی خۆیداو کەوتە ئینکاری کردنی وجوودی !! لە سوورەتێکی تردا هەر لەوبارەیەوە دەفەرموێ: (وهوالذى خلق من الماء بشرا فجعله نسبا وصهرا وكان ربك قديرا). پێغەمبەریشمان (محمد) لە فەرموودەیەکی قودسیدا دەفەرموێ:((ابن آدم ! أنى تعجزنى وقد خلقتك من مثل هذه؟! حتى إذا سويتك فعدلتك مشيت بين برديك وللأرض منك وئيد (الوئيد: شدة الوطء على الأرض يسمع كالدوى من بُعد) فجمعت ومنعت، حتى إذا بلغت الحلقوم، قلت: أتصدق وأنى أوان الصدقة)) رواه الإمام أحمد٤/٢١٠. پێغەمبەر ﷺ کەمێ (تف) دەکاتە ناو (لەپی) دەستی و پاشان دەفەرموێ: خوای باڵا دەست دەفەرموێ: ئەی بنیادەم! تۆ دەتەوێ لەدەستم دەرچی، خۆ من تۆم لە چەشنە ئاوێکی ئاوا بەدیهێناوە؟ کەچی بەدەعیەوە بەسەر زەوییدا دەچیت ! ماڵت کۆکردەوەو نەتبەخشی، هەتا گیان گەیشتە گەرووت، تازە دەڵێیت: ماڵ دەبەخشم! جاکەی کاتی بەخشین ماوە؟

**مەڕو ماڵاتیشی لەبەر ئێوە دروستکرد :**

﴿ ٥ **والأنعام خلقها**﴾ مەڕو بزن و گاو وشتریشی بۆ دروستکردن، لەسوورەتی (ئەنعام)دا زیاتر لەسەر ئەم نیعمەتانە چووە، لێرە هەر وەکو وەبیر هێنانەوەیەك خستییە ڕوو ﴿**لكم فيها دفء**﴾ هۆی گەرمییان تێدایە بۆتان، واتە: لەوانە جلك و بەرگ، کەمایەی خۆ گەرمکردنەوەتانە دروست دەکەن و، خۆ لەسەرما دەپارێزن ﴿**ومنافع**﴾ و بێ لەوەش گەلێ سوودو کەڵکی تریان تێدایە بۆتان (شیرو دۆو ڕۆن و پەنیرو..) ﴿**ومنها تأكلون**﴾ و لە گۆشتەکەیشیان دەخۆن ﴿ ٦ **ولكم فيها جمال**﴾ وە جەماڵ و جوانیشن بۆتان ﴿**حين تريحون**﴾ کاتێ ئێواران دەیانهێننەوە ﴿**وحين تسرحون**﴾ وە کاتێ بەریان دەدەن بۆ لەوەڕگاکانیان بەیانیان ، ئای چەندە مایەی دڵخۆشیی و جوانییە بۆتان و، خەڵکیش بە چاوی ڕێزەوە سەیرتان دەکەن ، چونکە سەروەت و سامان بۆ دنیاش مایەی قەدرو ئیعتیبارە لای خەڵکی خۆی ﴿ ٧ **وتحمل اثقالكم إلى بلد**﴾ وە کەل و پەلە قورسەکانیشتان بۆ ئەوشارانە رادەگوێزن و هەڵدەگرن، کە ئەگەر ئەو ئاژەڵانە نەبووبان ﴿**لم تكونوا بالغيه إلا بشق الأنفس**﴾ ئێوە بە ئەزیەت و ئازاری گیانیی و دەروونیی نەبووبا پێیان نەدەگەیەشتن، واتە: لەکاتی حەج و عومرەو بازرگانیی و هەر جم و جووڵێکی تردا بەئاسانی بێ ئەوانە بۆتان ئەنجام نە دەدران، هەر لەوبارەوە لەجێگایەکی تردا دەفەرموێ: (وإن لكم فى الأنعام لعبرة نسقيكم مما فى بطونها ولكم فيها منافع كثيرة ومنها تأكلون، وعليها وعلى الفلك تحملون) و ئەمانەو چەندین ئایەتی تر هەر لەبارەی ئەو نیعمەتە گرنگانەی خواوە هاتوون و هەن، پێویست ناکات بەهێنانیان ﴿**إن ربكم لرؤف رحيم**﴾ بەڕاستیی پەروەردگارتان بەرامبەر بەئێوە زۆر بە بەزەیی و، زۆریش میهرەبان و، دلاوایە ﴿ ٨ **والخيل والبغال والحمير**﴾ هەروەها ئەسپ و مایەن و هێسترو گوێدرێژی دروستکرد ﴿**لتركبوها وزينة**﴾ بۆ ئەوەی کاتێ ئێوە دەچن بۆ جێیەك سواریان بن، بێ لەوەیش ببنە زینەت و جوانیی و جەماڵی دنیاتان ، جا باشە خوایەکی دەسەڵاتدارو، خاوەن نیعمەتێکی ئاوا شیاوی پەرستن نییەو، ناتوانێ مردووان زیندوو بکاتەوە؟.

(ئەبوو حەنیفە) رەحمەتی خوای لێ بێت، پێیوایە کە گۆشتی ئەسپ و مایین قەدەغەیەو ناخورێ، چونکە لەئایەتەکەدا خوا دەفەرموێ: (والخيل والبغال والحمير لتركبوها وزينة) واتە: بۆ سواریی و زینەتی دروستکردوون ، نەك بۆ خواردن ، وەکو ئەو دەڵێت. بەڵام جەماوەری زاناکان وەکو ئیمامی (مالیك و، شافعیی و، ئەحمەد) و هاوەڵانیان و زۆربەی زاناکانی (سەلەف و خەلەف) یش دەڵێن: گۆشتی ئەسپ و مایین حەڵاڵە و، دەخورێ، بەم بەڵگانە: **یەکەم/** لە بوخاریی و موسلیمدا هاتووە: (نهى رسول الله ﷺ عن لحوم الحمر الأهلية، وأذن فى لحوم الخيل) کە پێغەمبەر ﷺ لەخواردنی گۆشتی (کەر)ی ماڵی ڕێگری کرد و، مۆڵەتی بە خواردنی گۆشتی ئەسپ و ماییندا. **دووەم/** ئیمامی

الجزء الرابع عشر — سورة النحل

وَتَحۡمِلُ أَثۡقَالَكُمۡ إِلَىٰ بَلَدٖ لَّمۡ تَكُونُواْ بَٰلِغِيهِ إِلَّا بِشِقِّ
ٱلۡأَنفُسِۚ إِنَّ رَبَّكُمۡ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٞ ٧ وَٱلۡخَيۡلَ وَٱلۡبِغَالَ
وَٱلۡحَمِيرَ لِتَرۡكَبُوهَا وَزِينَةٗۚ وَيَخۡلُقُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٨
وَعَلَى ٱللَّهِ قَصۡدُ ٱلسَّبِيلِ وَمِنۡهَا جَآئِرٞۚ وَلَوۡ شَآءَ لَهَدَىٰكُمۡ
أَجۡمَعِينَ ٩ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗۖ لَّكُم مِّنۡهُ
شَرَابٞ وَمِنۡهُ شَجَرٞ فِيهِ تُسِيمُونَ ١٠ يُنۢبِتُ لَكُم
بِهِ ٱلزَّرۡعَ وَٱلزَّيۡتُونَ وَٱلنَّخِيلَ وَٱلۡأَعۡنَٰبَ وَمِن كُلِّ
ٱلثَّمَرَٰتِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ١١
وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَۖ وَٱلنُّجُومُ
مُسَخَّرَٰتُۢ بِأَمۡرِهِۦٓۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ
١٢ وَمَا ذَرَأَ لَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُخۡتَلِفًا أَلۡوَٰنُهُۥٓۚ إِنَّ
فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَذَّكَّرُونَ ١٣ وَهُوَ ٱلَّذِي
سَخَّرَ ٱلۡبَحۡرَ لِتَأۡكُلُواْ مِنۡهُ لَحۡمٗا طَرِيّٗا وَتَسۡتَخۡرِجُواْ
مِنۡهُ حِلۡيَةٗ تَلۡبَسُونَهَاۖ وَتَرَى ٱلۡفُلۡكَ مَوَاخِرَ فِيهِ
وَلِتَبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِهِۦ وَلَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ١٤

٢٦٨ وَأَلۡقَىٰ فِي

موسلیم لە خاتوو (ئەسما)وە (خوای لیَ رازی بێت) دەگێڕێتەوە دەڵێت: (نحرنا على عهد رسول الله ﷺ فرسا فأكلناه ونحن بالمدينة) رواه مسلم، كتاب الصيد/١٥٤١. واتە: ئێمە لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ لەمەدینەدا ماینێکمان سەربڕی و خواردمان. سیَ یەم/ (دوحيه) دەڵیَ: بە پێغەمبەرم ﷺ گوت: (الا أحمل لك حمارا على فرس، فينتج لك بغلا فتركبَهَا؟ قال: إنما يفعل ذلك الذين لا يعلمون) مسند الإمام أحمد٤/٣١١. واتە: ڕێگەم دەدەیت گوێدرێژێك لە ماینێك بپەڕێنم ، بەشکو هێسترێکی ببیَ بۆ ئەملاو ئەولا سواری ببیت ؟ فەرمووی: ئەوە کاری ئەوکەسانەیە نازانن. ﴿ويخلق ما لا تعلمون﴾ بیَ لەوانەیش شتی وا دروست دەکات کە تا ئێستا ئێوە پێتان نەزانیوون، ڕێتان پیَ نەبردوون، وەکو چەندین جۆری تری گیانلەبەران و ئاژەڵ و هەرشتێکی تر ﴿[٩] وعلى الله قصد السبيل﴾ وە لەسەر خوایە ڕوونکردنەوەی ڕێگەی ڕاست و بانگکردن بۆی بە بەڵگەو سەلماندن .(سودیی) دەڵیَ: مەبەست بەو ڕێیە، ڕێگاو ڕێبازەکەی دینی ئیسلامە .﴿ومنها جائر﴾ و هەیشیانە لارو چەوتە، مرۆڤ ناگەیەنێتە ئامانج، وەکو ئایین وبەرنامەکانی تر ﴿ولو شاء لهداكم أجمعين﴾ خۆ ئەگەر خوا ویستبای ڕێنموونیتان بکات بۆڕیَ هەق و ڕاستەکە ، ئەوا پێکڕا هەمووتانی ڕێنوێنی دەکردن، بەڵام هەڵبژاردنی ڕێگاکان دەخاتە بەر دەس مرۆڤ خۆیی و، ئازادیشی دەکا بۆدیاریکردن و هەڵبژاردنیی، بۆئەوەی نەبێتە زۆرو زۆرکاریی، وەکو لەئایەتێکی تردا ئەو هەقیقەتە دووپات دەکاتەوەو دەفەرمویَ: (ولو شاء ربك لآمن من في الأرض كلهم جميعا). یان دەفەرمویَ: (ولو شاء ربك لجعل الناس أمة واحدة ولا يزالون مختلفين ..).

**باران نیشانەی دەسەڵاتی خوایە :**

﴿[١٠] هو الذي انزل من السماء ماء﴾ خوا هەر ئەو زاتە دەسەڵاتدارەیە کە لە حەواوە ئاو دەنێرێتە خوارەوە لەشێوەی باراندا ﴿لكم منه شراب﴾ ئێوە لێیدەخۆنەوە، ئاوێکی خۆش و شیرین بۆ خواردنەوەتان دەشیَ ﴿ومنه شجر فيه تسيمون﴾ هەر لەوئاوە دارو درەخت و گیا شین دەبیَ و، مەڕو ماڵاتیشی لیَ دەلەوەڕێنن، بەتایبەتی وشترەکانتان ﴿[١١] ينبت لكم به الزرع والزيتون والنخيل والأعناب ومن كل الثمرات﴾ هەر بەو ئاوو بارانەوە کشت و کاڵ و گەنم و جۆو و داری زەیتوون و، داری خورماو ڕەزتان بۆ دەڕوێنیَ و سەوز دەکاو غەیرەز ئەوانیش لە هەموو جۆرێکی میوەجات ﴿إن في ذلك لآية﴾ بەراستیی لەوانەدا بەڵگەیەکی ئاشکرای مەزن هەیە بۆ دۆزینەوەی خواو ددان نان بەدەسەڵاتی خوادا ﴿لقوم يتفكرون﴾ بۆ هەر گەلیَ بەوردیی بیربکاتەوە لە دەسەڵاتی ئەو، پاشان بییەویَ ددان بنێن بە یەکتاکی خوادا، ئەگینە خەڵکی لارو لاسار چ کەڵکێك وەردەگرێت لەوجۆرە شتانە ؟.

**شەوو ڕۆژو هەیڤ و خۆرو گژوو گیای بۆ ڕامکردن :**

﴿[١٢] وسخر لكم الیل والنهار والشمس والقمر﴾ هەرئەو زاتەیە شەوو ڕۆژو خۆرو مانگی بۆ ڕامکردن ﴿والنجوم مسخرات بأمره﴾ گشت ئەستێرەکانی تریش هەر بەفەرمانی ئەو ڕامکراون، زۆر بەئاسانی بەئاسماندا دێن و دەچن ﴿إن في ذلك لآيات لقوم يعقلون﴾ بە ڕاستیی لەو شتانەدا کۆمەڵیَ بەڵگەی مەزن هەیە بۆ گەلیَ تێبگا. لەسوورەتی (ئەعراف)یشدا تەئکیدی ئەوە دەکاتەوەو دەفەرمویَ: (إن ربكم الله الذي خلق السموات والأرض في ستة أيام ثم استوى على العرش يغشى اليل النهار يطلبه حثيثا والشمس والقمر مسخرات بأمره الا له الخلق والأمر تبارك الله رب العالمين/٥٤ ﴿[١٣] وما ذرا لكم في الأرض مختلفا الوانه﴾ وە لەم زەوییەشدا چەندین شتی جۆراو جۆرو، ڕەنگ و تام لێکجیاوازی بۆ دروستکردوون، ئەگەرچی لە یەك ڕیشەیش بن ﴿إن في ذلك لآية لقوم يذكرون﴾ بێگومان

لەوەشدا بەڵگەی گەورەو مەزن هەیە بۆ کۆمەڵ و خەڵکێك بیر بکاتەوەو ئامۆژگاری وەرگریٚ بۆ بەیەك دانانی خوای کار جوان.

## زەریا و کێوو چۆم و ئەستێرە بەڵگەی بوونی خوان :

﴿[١٤] وهو الذی سخر البحر﴾ هەر ئەو زاتە دەسەڵاتدارەیە کەدەریای رامکرد ﴿لتأکلوا منه لحما طریا﴾ هەتا ئێوە گۆشتێکی ناسکی تازەی لیٚ دەربهێنن و لێی بخۆن، لەماسی یەکانی سوود وەربگرن و، بەدەر ئەوانیش چەندین کەڵکی تری لیٚ وەرگرن ﴿وتستخرجوا منه حلیة تلبسونها﴾ هەتا مرواری و مەرجان و هەر شتێکی تری جوانی لیٚ دەر بهێنن و ، بیکەنە خشڵ و بەکاری بێنن ، وەك ئەم ئایەتەش ئەفەرمویٚ: (یخرج منهما اللؤلؤ والمرجان)٢٢/٥٥

الجزء الرابع عشر | سُورَةُ النَّحْلِ

وَأَلْقَىٰ فِي الْأَرْضِ رَوَاسِيَ أَن تَمِيدَ بِكُمْ وَأَنْهَارًا وَسُبُلًا
لَّعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٥﴾ وَعَلَامَاتٍ ۚ وَبِالنَّجْمِ هُمْ يَهْتَدُونَ
﴿١٦﴾ أَفَمَن يَخْلُقُ كَمَن لَّا يَخْلُقُ ۗ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿١٧﴾ وَإِن
تَعُدُّوا نِعْمَةَ اللَّهِ لَا تُحْصُوهَا ۗ إِنَّ اللَّهَ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٨﴾
وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُسِرُّونَ وَمَا تُعْلِنُونَ ﴿١٩﴾ وَالَّذِينَ يَدْعُونَ
مِن دُونِ اللَّهِ لَا يَخْلُقُونَ شَيْئًا وَهُمْ يُخْلَقُونَ ﴿٢٠﴾ أَمْوَاتٌ غَيْرُ
أَحْيَاءٍ ۖ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ ﴿٢١﴾ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ ۚ
فَالَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ قُلُوبُهُم مُّنكِرَةٌ وَهُم مُّسْتَكْبِرُونَ
﴿٢٢﴾ لَا جَرَمَ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ۚ إِنَّهُ
لَا يُحِبُّ الْمُسْتَكْبِرِينَ ﴿٢٣﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُم مَّاذَا أَنزَلَ رَبُّكُمْ ۙ
قَالُوا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ ﴿٢٤﴾ لِيَحْمِلُوا أَوْزَارَهُمْ كَامِلَةً
يَوْمَ الْقِيَامَةِ ۙ وَمِنْ أَوْزَارِ الَّذِينَ يُضِلُّونَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ ۗ أَلَا
سَاءَ مَا يَزِرُونَ ﴿٢٥﴾ قَدْ مَكَرَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ
فَأَتَى اللَّهُ بُنْيَانَهُم مِّنَ الْقَوَاعِدِ فَخَرَّ عَلَيْهِمُ السَّقْفُ
مِن فَوْقِهِمْ وَأَتَاهُمُ الْعَذَابُ مِنْ حَيْثُ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٢٦﴾

٢٦٩

﴿وتری الفلك مواخر فیه﴾ وە کەشتیەکان بەچاوی خۆت دەبینی کە دێن و دەچن و بەسنگیان ئاوی دەریا لەت دەکەن لە رۆیشتندا ﴿ولتبتغوا من فضله﴾ و تا بەهۆیانەوە لە نیعمەت و رۆزی خوا بگەڕێن و کەڵك وەرگرن و بازرگانیی بکەن ﴿ولعلکم تشکرون﴾ و بەشکو سوپاسی خوا بکەن، لەسەر ئەو هەموو نیعمەت و بەهرانە پێی بەخشیوون ﴿[١٥] والقی فی الأرض رواسی﴾ وە لەزەوییدا کێوە زۆر بەرزو بڵندەکانی داناو کردنیە لەنگەرو مێخ و زەویی پێبەستنەوە ﴿ان تمید بکم﴾ تا ئێوە نەلەرزێنیٚ و، بەئاسانی بتوانن لەسەری بژین و بگەنە مەبەستەکانی خۆتان و رێنوێن بن ﴿وانهارا وسبلا﴾ و چەندین چۆمو رووبارو رێبازیشی نیشاندان ﴿لعلکم تهتدون﴾ بەشکو رێی ژیانتان بدۆزنەوەو بەخۆشیی بژین ﴿[١٦] وعلامات﴾ وە چەندین نیشانەی تریشی بۆدانان، وەکو کێوو گردۆڵکەو ئاوو هاوشێوەی ئەوانە بەرۆژدا ، بۆئەوەی رێبواران لەوشکانی و دەریادا رێیان پێدەرکەن بۆ گەیشتن بەئامانج و مەبەستەکانیان ﴿وبالنجم هم یهتدون﴾ ئەوان بەئەستێرەکانیش رێیان دەردەکرد لەتاریکایی شەودا ﴿[١٧] أفمن یخلق کمن لا یخلق﴾ دیارە ئەوانە هەموو کاری خوان" دە ئاخۆ کەسێك بتوانیٚ بەدی بهێنیٚ و، مەیلی لەهەر شتێك ببیٚ بەئاسانی دروستی بکات، وەکو ئەوە وایە کەتوانای دروستکردنی هیچ شتێکی نەبیٚ و، نەتوانیٚ تەنانەتی شتێکی سادەیش دروست بکات ؟ ﴿أفلا تذکرون﴾ ئایا ئیتر ئێوە بیرناکەنەوە و، پەندو ئامۆژگاری وەرناگرن ؟ ﴿[١٨] وإن تعدوا نعمة الله لا تحصوها﴾ ئەوانە کەمێکبوون لەنیعمەت و بەخششەکانی خوای گەورە، خۆ ئەگەر بتانەویٚ گشت نیعمەت و چاکەکانی خوا بژمێرن، بۆتان ناژمێردرێن ﴿إن الله لغفور رحیم﴾ خوای لەکارزان زۆر لێبوردەیە بەرامبەر بەدرێغییەکانتان ، زۆریش دلۆڤان و میهرەبانە ﴿[١٩] والله یعلم ماتسرون وما تعلنون﴾ هەرشتیٚ ئێوە بیشارنەوەو، بە پەنامەکیی و بەنهێنی بیکەنو، هەرشتێکیش دەربخەن و بەئاشکرا ئەنجامی بدەن، خوا هەر دەیزانیٚ ﴿[٢٠] والذین یدعون من دون الله لا یخلقون شیئا﴾ ئەو بتانەش کە ئەوانە

لەباتی خوا داوای هێنانی خێرو، لادانی شەڕو خراپەیان لێ دەکەن و دەیانپەرستن، قەت لێیان نایەت هیچ شتێ دروست بکەن ﴿وهم يخلقون﴾ و خۆیشیان دروست دەکرێن، کەوابوو چۆن دەبنە خواو بپەرسترێن !! ﴿[٢١] أموات غير احياء﴾ خۆ مردوون و زیندوونیین ﴿وما يشعرون ايان يبعثون﴾ هەر هەستیش ناکەن کەی پەرستیارەکانیان زیندوو دەکرێنەوە، جائیتر چۆن داوای خێرو قازانجیان لێدەکرێت ؟ لەجێگایەکی تردا دەفەرموێ: (اتعبدون ماتنحتون، والله خلقكم وما تعملون/ ٩٥ ،٩٦).

**بەدەر لە ( الله ) کەسی دی نیە :**

﴿[٢٢] إلهكم إله واحد﴾ پەرستراوی بە هەقی ئێوە، تەنها پەرستراوێکی تاك و تەنیایە، بێ شەریك و بێ هاوەڵەو هەر خۆیەتی، ئەگەر چی کافرەکانیش پێیان سەیرە! وەکو لەجێیەکی تردا لەسەر زاری ئەوان دەفەرموێ : (أجعل الآلهة إلها واحدا إن هذا لشيء عجاب) یان دەفەرموێ: (وإذا ذكر الله وحده اشمأزت قلوب الذين لايؤمنون بالآخرة، وإذا ذكر الذين من دونه إذا هم يستبشرون) ﴿فالذين لا يؤمنون بالآخرة﴾ جا ئەوانەی کە بەڕۆژی دوایی باوەڕناهێنن ﴿قلوبهم منكرة﴾ دڵیان نکوولی تەنیایی و وەحدانیەتی خوا دەکا ﴿وهم مستكبرون﴾ و لەگەڵ ئەوەیشدا خۆ بەزل دەزانن لە شوێنکەوتنی هەق ! ﴿[٢٣] لا جرم أن الله يعلم ما يسرون وما يعلنون﴾ راستەو هەقە، کە خوا دەزانێ و بەئاگایە بەگشت ئەو شتانە ئەوان لەخەڵك دەیشارنەوە, یان دەری دەبڕن و بەئاشکرا دەیکەن .

سەرنجێك: بۆ ماناو مەبەست لەوشەی (لاجرم): (خەلیل) و (سیبویە)ی نەحویی دەڵێن: بە واتاو مانای (حقا) هاتووە، وە دەڵێن: (ف ((لا)) و((جرم)) كلمة واحدة، وعن الخليل أيضا أن معناها: لابد، ولامحالة. وقال الزجاج :(لا) هاهنا نفى، ورد لقولهم: إن الأصنام تغنيهم..) شیاوی ئاماژە بۆ کردنە وشەی(لاجرم) لە قورئاندا – لەم ئایەتانەدا- چوار جارهاتووە: (٢٣)ێ و(١٠٩)ی (نەحل). (٤٣)ی (غافر). (٢٢)ی(هود). ﴿إنه لايحب المستكبرين﴾ خۆ بەراستیی خوا خۆشی نایە لە پێشێلکەرانی هەق و راستیی و، خەڵکانی خۆ بەزلزان ، لە سوورەتێکی تردا دەفەرموێ : (إن الذين يستكبرون عن عبادتي سيدخلون جهنم داخرين).

**لای خوا نەناسان قورئان چیرۆکی پێشینانە :**

﴿[٢٤] وإذا قيل لهم ماذا انزل ربكم﴾ وە هەرکاتێ بەو هاوبەشدانەرانە گوترابا: ئەرێ پەروەردگارتان چی دابەزاندۆتە خوارەوە ؟ ﴿قالوا اساطير الأولين﴾ لە وەڵامە راستەکە خۆ دەبوێرن و دەڵێن: چی ناردووە ؟ هەر ئەفسانەو ئوستورەو پرو پاڵانتەی پێشینانی ناردووە, دیارە بۆیە ئەوقسانەش دەکەن ، هەتا بە خەیاڵی خاوی خۆیان بتوانن خەڵك لە دینی ئسلام و راستیەکان رێگری بکەن و، ئیسلام بەشتێکی ئەفسانەو بێ ناوەرۆك نیشانی کۆمەڵگە بدەن !! ﴿[٢٥] ليحملوا اوزارهم كاملة يوم القيامة﴾ ئەوقسەیە دەکەن هەتا رۆژی قیامەت باری گوناهەکانی خۆیان بە تەواوی هەڵگرن ﴿ومن اوزار الذين يضلونهم بغير علم﴾ وە لە گوناهی ئەو کەسانەش هەڵگرن کە بە نەزانیی و گێلانەو بێ بەڵگە، ئەوان گومڕایان دەکەن، چونکە ئەوان سەرۆك و فەرماندەن و، ئەمانیش شوێنکەوتوو خەڵەتاو ﴿الا ساء ما يزرون﴾ هۆشیار بن ! چ بارێکی نالەبارو خراپ هەڵدەگرن ؟.

**پێشینانیشیان هەر دەهۆ باز بوون :**

﴿[٢٦] قد مكر الذين من قبلهم﴾ بەڕاستیی ئەوانەش لە پێشیانەوە بوون، هەر وەکو ئەمانە فرووفێڵیان لەگەڵ پەیامبەرەکانیاندا کرد بۆ لەناو بردنیان ! ﴿فأتى الله بنيانهم من القواعد﴾ ئینجا خوا خانوو بەرەیانی لەبن هێنا ﴿فخر عليهم السقف من فوقهم﴾ بەو شێوە کە سەروو و میچی خانووەکانیان بەسەردا کەوت و گشت مردن، وەکو

لەجێگایەکی تردا دەفەرموێ: (كلما أوقدوا نارا للحرب أطفأها الله..) یان دەفەرموێ: (فأتاهم الله من حيث لم يحتسبوا وقذف في قلوبهم الرعب..) ﴿واتاهم العذاب من حيث لا يشعرون﴾ وە لە شوێنێکەوە سزایان بۆهات کە ئەوان هەستیان پێ نەدەکردو بە خەیاڵیاندا نەدەهات ﴿[٢٧] ثم يوم القيامة يخزيهم﴾ لە پاشان لە ڕۆژی قیامەتیشدا ریسوایان دەکاو، نهێنییەکانیان دەردەخات، وەکو دەفەرموێ: (يوم تبلى السرائر..) ﴿ويقول اين شركائي﴾ وەخوا ئەفەرموێ: ئەو هاوبەشانەی کە داتاننان بۆم لەکوێن ؟ ﴿الذين كنتم تشاقون فيهم﴾ ئەوانەی کە ئێوە لەبەر ئەوان ململانێ و دەمەقاڵێ و دژایەتیتان لەگەڵ پەیامبەراندا دەکرد ﴿قال الذين أوتوا العلم﴾ ئەوانەی کەزانستیی دنیاو قیامەتیان لایەو، دەزانن ئەنجام چۆن دەبێت، دەڵێن: ﴿إن الخزى اليوم والسوء على الكافرين﴾ ئەمڕۆ ڕیسوایی و سزای ئابڕووبەرو ، حەیاچوون تەنها بۆکافرو بێ باوەڕانە. ﴿[٢٨] الذين تتوفاهم الملائكة﴾ ئەوانەی کە فریشتەکان گیانیان دەکێشن ﴿ظالمي انفسهم﴾ و ستەمکاری گیانی خۆیانن ، واتە: موشریکن و هاوبەشیان بۆ خوا دادەنا ﴿فألقوا السلم﴾ ئینجا لەوکاتەدا بەناچاریی ملکەچ و تەسلیم دەبن و دەڵێن: ﴿ماكنا نعمل من سوء﴾ ئێمە هەرگیز کاری ناپەسەندو خراپمان نەکردووە لە دنیادا ! لە قیامەتیشدا بۆ خۆدزینەوە لە تاوانی شیرك دەڵێن: (والله ربنا ماكنا مشركين) یان بە سوێند جەخت دەکەنەوە لەسەر رازی کردنی خوای بالادەست, وەك خۆی لە سەر زاری ئەوان دەفەرموێ: (يوم يبعثهم الله جميعا فيحلفون له كما يحلفون لكم) جا خوای کارزان دەفەرموێ: ﴿بلى إن الله عليم بما كنتم تعملون﴾ بەڵێ، بێگومان خوا خۆی چاك دەزانێ بەوەی کردووتانە ﴿[٢٩] فادخلوا ابواب جهنم﴾ دەسا هەمووتان لە دەرگاکانی دۆزەخەوە بچنە جەهەندەم ، هەر یەکە بەپێی تاوان و گوناحی خۆی ولە دەرگای خۆیەوە ﴿خالدين فيها﴾ بە هەتاهەتاییش لەوێ بمێننەوە ﴿فلبئس مثوى المتكبرين﴾ جاجێگەی خەڵکانی لووتبەرزو خۆبەزلزان - لە ئاستی خوا پەرستییدا- زۆر خراپ و ناهەموارە، لەم ئایەتەشدا هەرجەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە دەفەرموێ: (لايقضى عليهم فيموتوا ولا يخفف عنهم من عذابها..) یان دەفەرموێ: (النار يعرضون عليها غدوا وعشيا ويوم تقوم الساعة أدخلوا آل فرعون أشد العذاب).

**هەرچی باشی تەواوە خوا ئەوە دەنێرێ :**

﴿[٣٠] وقيل للذين اتقوا﴾ وە بەخەڵکانی خۆپارێز دەگوترێ: ﴿ماذا انزل ربكم﴾ پەروەردگارتان چی بەخەڵات بۆ پێغەمبەر ﷺ ناردە خوارێ ﴿قالوا خيرا﴾ دەڵێن: هەرچی باشە ئەوەی ناردووە ﴿للذين احسنوا في هذه الدنيا حسنة﴾ جا بۆ ئەوانەی لەم ژیانی دنیایەدا ئاکاری چاکیان کردووە، پاداشتی باش و چاکیان بۆ هەیە ﴿ولدار الآخرة خير﴾ خۆ بەڕاستیی خانەو ماڵی دوا ڕۆژ زۆر باشترە بۆیان ﴿ولنعم دار المتقين﴾ و بێگومان خانەی

الجزء الرابع عشر — سورة النحل

ثُمَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يُخْزِيهِمْ وَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَائِيَ الَّذِينَ
كُنتُمْ تُشَاقُّونَ فِيهِمْ ۚ قَالَ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ إِنَّ الْخِزْيَ
الْيَوْمَ وَالسُّوءَ عَلَى الْكَافِرِينَ ﴿٢٧﴾ الَّذِينَ تَتَوَفَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ
ظَالِمِي أَنفُسِهِمْ ۖ فَأَلْقَوُا السَّلَمَ مَا كُنَّا نَعْمَلُ مِن سُوءٍ ۚ بَلَىٰ
إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٨﴾ فَادْخُلُوا أَبْوَابَ جَهَنَّمَ
خَالِدِينَ فِيهَا ۖ فَلَبِئْسَ مَثْوَى الْمُتَكَبِّرِينَ ﴿٢٩﴾ ۞ وَقِيلَ
لِلَّذِينَ اتَّقَوْا مَاذَا أَنزَلَ رَبُّكُمْ ۚ قَالُوا خَيْرًا ۗ لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا فِي
هَٰذِهِ الدُّنْيَا حَسَنَةٌ ۚ وَلَدَارُ الْآخِرَةِ خَيْرٌ ۚ وَلَنِعْمَ دَارُ الْمُتَّقِينَ
﴿٣٠﴾ جَنَّاتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ ۖ لَهُمْ فِيهَا
مَا يَشَاءُونَ ۚ كَذَٰلِكَ يَجْزِي اللَّهُ الْمُتَّقِينَ ﴿٣١﴾ الَّذِينَ تَتَوَفَّاهُمُ
الْمَلَائِكَةُ طَيِّبِينَ ۙ يَقُولُونَ سَلَامٌ عَلَيْكُمُ ادْخُلُوا الْجَنَّةَ بِمَا
كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٣٢﴾ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا أَن تَأْتِيَهُمُ الْمَلَائِكَةُ
أَوْ يَأْتِيَ أَمْرُ رَبِّكَ ۚ كَذَٰلِكَ فَعَلَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ وَمَا ظَلَمَهُمُ
اللَّهُ وَلَٰكِن كَانُوا أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٣٣﴾ فَأَصَابَهُمْ
سَيِّئَاتُ مَا عَمِلُوا وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ ﴿٣٤﴾

پارێزگاران چاکخانەیەکە ﴿[٣١] جنات عدن﴾ کەچەند باخ و بەهەشتێکی مانەوەیە ﴿یدخلونها﴾ و بەدڵی خۆش و شادییەوە دەچنە ناویەوە ﴿تجری من تحتها الأنهار﴾ چەند چۆم و ڕووبارییش بەژێر دارەکانییدا دەڕوا ﴿لهم فیها ما یشاؤن﴾ هەر شتێك ئارەزو بکەن، بێ عەزیەت و نارەحەتیی ، لەوێ دەستیان دەکەوێ ، وەکو دەفەرموێ: (و فیها ما تشتهیه الأنفس وتلذ الأعین وأنتم فیها خالدون) ﴿کذلك یجزی الله المتقین﴾ ئاوا خوا پاداشت دەدات بەپارێزکاران ، دەسا ئێوەیش ئاکار چاکبن ﴿[٣٢] الذین تتوفاهم الملائکة طیبین﴾ ئەوانەی کە فریشتە گیانیان دەکێشن و دڵشادو خۆشحاڵن و لەدنیا پاك و چاك کاریان کردووە، ﴿یقولون سلام علیکم﴾ پێیان دەڵێن: سڵاوتان لەسەر بێت ﴿ادخلوا الجنة بما کنتم تعملون﴾ دەفەرموون بەهۆی ئەو کردەوە چاکانەوە کردتانن بچنە بەهەشتەوە

سُورَةُ النَّحۡلِ — الجُزۡءُ الرَّابِعَ عَشَرَ

وَقَالَ ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْ لَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَا عَبَدۡنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَيۡءٖ نَّحۡنُ وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمۡنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَيۡءٖۚ كَذَٰلِكَ فَعَلَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ فَهَلۡ عَلَى ٱلرُّسُلِ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ﴿٣٥﴾ وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَۖ فَمِنۡهُم مَّنۡ هَدَى ٱللَّهُ وَمِنۡهُم مَّنۡ حَقَّتۡ عَلَيۡهِ ٱلضَّلَٰلَةُۚ فَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ﴿٣٦﴾ إِن تَحۡرِصۡ عَلَىٰ هُدَىٰهُمۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي مَن يُضِلُّۖ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٣٧﴾ وَأَقۡسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهۡدَ أَيۡمَٰنِهِمۡ لَا يَبۡعَثُ ٱللَّهُ مَن يَمُوتُۚ بَلَىٰ وَعۡدًا عَلَيۡهِ حَقّٗا وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٣٨﴾ لِيُبَيِّنَ لَهُمُ ٱلَّذِي يَخۡتَلِفُونَ فِيهِ وَلِيَعۡلَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّهُمۡ كَانُواْ كَٰذِبِينَ ﴿٣٩﴾ إِنَّمَا قَوۡلُنَا لِشَيۡءٍ إِذَآ أَرَدۡنَٰهُ أَن نَّقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٤٠﴾ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ فِي ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مَا ظُلِمُواْ لَنُبَوِّئَنَّهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗۖ وَلَأَجۡرُ ٱلۡأٓخِرَةِ أَكۡبَرُۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ﴿٤١﴾ ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٤٢﴾

٢٧١

﴿[٣٣] هل ینظرون إلا أن تأتیهم الملائکة أو یأتی أمر ربك﴾ ئاخۆ ئەوانە کە هەر خەریکی بێ دینی و لاسارین ، بێجگە لەوە کەفریشتەکان بێنە لایان و، گیانیان بکێشن، وە یان فەرمانی سزای پەروەردگاریان بۆ بێت ، چاوەڕوانی چی بن ؟ ﴿کذلك فعل الذین من قبلهم﴾ ئەوانەش کە لەپێش ئەمانەوە بوون هەر وەکو ئەمان هەر ئەوکارە ناپەسەندانەیان کرد، بۆیە دەرەنجام دووچاری سزای شیاو بەخۆیان بوون ﴿وما ظلمهم الله﴾ خۆ خواش ستەم و ناحەقی لێ نەکردن کە سزایدان ﴿ولکن کانوا أنفسهم یظلمون﴾ بەڵکو خۆیان ستەمیان لە خۆیان کردو، لە پێغەمبەرەکان یاخیی بوون و، هاوبەش و هاوەڵیان بۆ خوا دانا! ﴿[٣٤] فأصابهم سیئات ما عملوا﴾ ئەوجا تۆڵەی کاروکردەوە خراپەکانی خۆیانیان تووش بوو ﴿وحاق بهم ماکانوا به یستهزئون﴾ وە ئەو سزایەی گاڵتەیان پێدەکرد ئابلۆقەی دان لەتۆڵەدا ، لەقیامەتیشدا پێیان دەگوترێت: (هذه النار التی کنتم بها تکذبون) ﴿[٣٥] وقال الذین أشرکوا﴾ وە ئەوانەی هاوبەشیان بۆخوا دانا، بۆ خۆ قوتارکردن لەو سزایە دەڵێن: ﴿لو شاء الله ما عبدنا من دونه من شئ نحن ولا آباؤنا ولا حرمنا من دونه من شئ﴾ ئەگەر خوا ویستبای کە هەر ئەو بپەرستین و، کەسێکی تر نەپەرستین، ئیتر نە ئێمەو نە باوو باپیرانمان غەیری ئەومان نەدەپەرست، وە نەمان دەتوانی بێ فەرمان و مۆڵەتی خۆیشی، هیچ شتێك حەرام و یاساغ بکەین! ﴿کذلك فعل الذین من قبلهم﴾ بەڵێ ئەو کەسانەش کە لەپێش ئەمانەوە بوون هەر ئەوەیان دەگوتوو، هەر ئاواشیان دەکرد ﴿فهل علی الرسل إلا البلاغ المبین﴾ ئایا پێغەمبەران جگە لە ڕاگەیاندنێکی ئاشکراو روون، شتێکی تریان لەسەرە؟ واتە: پێغەمبەران غەیرەز ڕاگەیاندنێکی ئاشکرایان لەسەر نیە, وەك پرسینەوەو سزادان ﴿[٣٦] ولقد بعثنا فی کل امة رسولا﴾ بەراستیی بۆناو هەموو ئوممەت و نەتەوەیەك لەهەموو سەردەمێکدا پەیامبەرێکمان ناردووە ﴿أن اعبدوا الله واجتنبوا الطاغوت﴾ بۆ ئەوە پێیان بڵێ: تەنها خوا بپەرستن و، لە(تاغووت) و یاسا پوچەڵەکان دووربن. بەڵێ ئەو دووخاڵە: (خوا پەرستن

و، وەلانانی تاغووت) کەهەر پێغەمبەرەی داویەتی بەگوێی ئوممەتەکەی خۆیدا ئەساس و بناغەی گشت ئایینەکان و دینی ئیسلامیشە ، لەجێگایەکی تردا دەفەرموێ: (وما أرسلنا من قبلك من رسول إلا نوحی إلیه أنه لاإله إلاأنا فاعبدون). ﴿فمنهم من هدی الله﴾ بازێکیان خوای دلۆڤان خۆی رێی نیشاندان، چونکە ئامادەو شیاو بوون ﴿ومنهم من حقت علیه الضلالة﴾ هی وایشیان هەبوو بەهۆی لاساری خۆیانەوە لارێی و گومڕایی بۆ بڕایەوە ﴿فسیروا فی الأرض﴾ جا ئادەی بەسەر زەوییدا بچن و بگەڕێن ﴿فانظروا کیف کان عاقبة المکذبین﴾ و ببینن و بنواڕن چارەنووسی ئەوانەی کە بڕوایان نەهێناو، پەیامبەرەکانیان بە درۆزن دانا چۆن بوو؟ لەجێگایەکی دیکەدا دەفەرموێ: (دمر الله علیهم وللکافرین أمثالها) یان دەفەرموێ: (ولقد کذب الذین من قبلهم فکیف کان نکیر)﴿[٣٧] إن تحرص علی هداهم﴾ هەرچەندە تۆ ئەی پێغەمبەر! ﷺ هەوڵ بدەیت و سووربیت بۆ بڕواهێنان و ڕێنماییان، کەڵکی نابێ بۆیان، چونکە ئەوانە لاڕێ و گومڕان ﴿فإن الله لایهدی من یضل﴾ بەڕاستیی خوایش ڕێنوێنی کەسێك ناکات کەخۆی ڕێگەی گومڕایی هەڵبژێرێ بۆ گومڕابوونی خۆیی و، چەواشەکردنی خەڵکیی ، وەکو دەفەرموێ: (ومن یرد الله فتنته فلن تملك له من الله شیئا) ﴿ومالهم من ناصرین﴾ وە هیچ یارو پشتیوانێکیشیان بۆ نابێ و، دەسەڵاتی تەواو هی خوا دەبێ، لەشوێنێکی تردا بۆ دووپاتکردنەوەی دەفەرموێ: (ألا له الخلق والأمر تبارك الله رب العالمین) ﴿[٣٨] واقسموا بالله جهد أیمانهم﴾ وە بە هەرچی توانایان بوو سوێندیان خوارد ﴿لایبعث الله من یموت﴾ کە ئەوی دەمرێ قەت خوا زیندووی ناکاتەوە، دیارە بەلای ئەقڵ و ژیری ئەوانەوە زیندوو بوونەوە کارێکی نەگونجاوە ! ﴿بلی وعدا علیه حقا﴾ نا.. وانییە، بەڵکو خوا مردوان زیندوو دەکاتەوە، چونکە بەڵێنیی لەسەر داوە و بڕاوەتەوە ﴿ولکن اکثر الناس لا یعلمون﴾ بەڵام زۆربەی ئەو خەڵکە جاحێڵن و نازانن بەڵێنی خوا بە زیندووبوونەوە هەق و ڕاستە ﴿[٣٩] لیبین لهم الذی یختلفون فیه﴾ مردوان زیندوو دەکاتەوە تائەوەی ئەوان جیاوازیی و، ناکۆکییان تێیدا هەبوو، بۆیان ڕوون بکاتەوە، واتە: بۆ ئەوەی دەری بخا زیندوبوونەوەو هەرچی تر ئەوان جیاوازیان تێیدا هەبوو بەڕاست دەرچوو ﴿ولیعلم الذین کفروا﴾ و با ئەوانەی کە کافرو بێ باوەڕن چاك بزانن ﴿انهم کانوا کاذبین﴾ کە بێگومان درۆزن بوون کە دەیانگوت مردوو زیندوو نابێتەوە، ئینجا پاش ئەوە فریشتەکان پێیان دەڵێن: (هذه النار التی کنتم بها تکذبون ، أفسحر هذا أم أنتم لاتبصرون ، إصلوها فاصبروا أو لاتصبروا سواء علیکم إنما تجزون ماکنتم تعملون) ﴿[٤٠] إنما قولنا لشئ إذا أردناه﴾ مردوو چۆن زیندوو نابێتەوە، خۆ ئێمە کاتێ بمانەوێ هەر شتێ بکەین، قسەمان هەر ئەمەیە ﴿أن نقول له کن فیکون﴾ کەپێی بڵێین: ببە، دەست بەجێ ئەویش دەبێ و دێتە دی، ئیتر هیچ نارەحەتییەکی تێدا نییە بۆمان، دیارە قیامەتیش یەکێکە لەوشتانە کە زۆر بەئاسان دەبن، لەسوورەتێکی تردا دەفەرموێ: (وما أمرنا إلا واحدة کلمح بالبصر) یان دەفەرموێ: (ماخلقکم ولا بعثکم إلا کنفس واحدة..).

**کۆچبەرانی ڕێی خوا :**

﴿[٤١] والذین هاجروا فی الله من بعد ماظلموا﴾ وەئەو کەسانەیش کە لەبەر خوا وڵات و نیشتمانی خۆیانیان بەجێ هێشت ، پاش ئەوەکە ناهەقیی و ستەمیان لێکراو ئازار دران، واتە: ئەوانەی کۆچیان کرد بۆ (حەبەشە) ﴿لنبوئنهم فی الدنیا حسنة﴾ بە تەئکید ئێمەیش هەر لە دنیادا لەجێگایەکی چاکدا نیشتەجێیان دەکەین، ئەوەبوو بۆ دوایی هاتنە (مەدینە)و، خەڵکەکەی پێشوازیەکی گەرم و گوڕیان لێکردن و حەوانیانەوە ﴿ولأجرالآخرة اکبر لو کانوا یعلمون﴾ دڵنیابن پاداش و مزەی ئەو دونیا زۆر باشترو گەورەتر دەبێ لە پاداشی دنیا، ئەگەر دوا کەوتووان لە هیجرەت زانیبایان ﴿[٤٢] الذین صبروا﴾ کۆچبەران ئەوانەبوون کە لەسەر جێهێشتنی زێدو شارو هەموو شتێك لەبەر

خوا ئارامیان گرت ﴿وعلى ربهم يتوكلون﴾ و تەنها هەر بە پەروەردگاریان پشت دەبەستن, بۆیە توانیان وڵات و نیشتمان وسامان و خزم و کەس و کاریان جێهێڵن .

**پێغەمبەران هەموو لە پیاوان بوون :**

(ئیبن عەباس) دەڵێ: خوای جوانکار هەر کە پێغەمبەرمان (موحەممەد)ی ﷺ نارد، عەرەبەکان نکوولی و ئینکارییان کردو گوتیان: چۆن دەبێ لە نێوبەرەی ئینساندا پێغەمبەر بنێردرێ ! چونکە بەلای ئەوانەوە پێغەمبەر هەر دەبێ فریشتە بێ، جا ئەوەبوو خوا لە سوورەتی (یونس)دا فەرمووی: (أكان للناس عجبا أن أوحينا الى رجل منهم..) لەم سوورەتەشدا دەفەرموێ: ﴿[٤٣] وما أرسلنا من قبلك إلا رجالا نوحى إليهم﴾ وە لەپێش تۆیشدا ئەی پێغەمبەر! ﷺ هەر پیاومان کردۆتە پێغەمبەرو سروشمان بۆ کردووە، واتە: پێغەمبەران لە فریشتە و لەهیچ دروستکراوێکی تر نە نێردراون ، بەڵکو هەر لەئادەمزادو جنسی ئینسان بوون، لە جێگایەکی تردا جەخت لەسەر ئەوە دەفەرموێ: (وما أرسلنا من قبلك إلا رجالا نوحى إليهم من أهل القرى..) ﴿فاسألوا أهل الذكر إن كنتم لا تعلمون * [٤٤] بالبينات والزبر﴾ جا ئەگەر ئێوە ئەو ڕاستییەتان نەزانیوەو نکوولی دەکەن، دەسا فەرموون لەو جوولەکەو فەلانەی زاناو بەئاگان لە بەڵگەو کتێبەکان بپرسن ، چونکە ئەوان بەئاگان و چاك دەزانن کە ئێمە لەپیاوان نەبێ پێغەمبەرانمان نەناردوون ؟ ﴿وانزلنا إليك الذكر﴾ وا بۆ تۆش ئەم قورئانەمان دابەزاندە خوارێ ﴿لتبين للناس ما نزل إليهم﴾ بۆ ئەوەی بۆ ئەو خەڵکە روون بکەیتەوە ئەوەی بۆیان دابەزێنراوە لە یەکخواپەرستی و شەرع و حەلاڵ و حەرام..هتد ﴿ولعلهم يتفكرون﴾ وە بەشکو بیربکەنەوەو ڕێنمابن.




**ئاخۆ فێڵبازان لەقاری خوا ئەمینن ؟**

﴿[٤٥] افأمن الذين مكروا السيئات أن يخسف الله بهم الأرض﴾ ئایا ئەوانەی کە پیلانەکانیان ڕێکخستبوو بە نیازی لەناوبردن و کوشتنی پەیامبەر ﷺ ئاخۆ دڵنیان لەوەی کەخوا نوقمی زەوییان ناکات، وەکو قاروونی نقومکرد ؟ ﴿او يأتيهم العذاب من حيث لا يشعرون﴾ یان لەلایەکەوە سزایان بۆ بێت کە ئەوان هەر هەستی پێ نەکەن ؟ واتە: ئەو لارێ بوونی ئەوانە، هەر ئەوەی شایەنە، ئەگەر حیلم و حەوسەڵەی خوا نەبوایە، بۆیە لە سوورەتێکی تردا دەفەرموێ: (ءأ منتم من فى السماء أن يخسف بكم الأرض فإذا هى تمور). ﴿[٤٦] أو يأخذهم فى تقلبهم﴾ یان لەڕێی جم وجووڵ و گەشت و گەڕیاندا بۆ بازرگانیی و رزق و رۆزیی قاریان لێ بگرێ ؟ ﴿فما هم بمعجزين﴾ نەشتوانن خوا دەستەوسان بکەن و ، خۆیان دەرباز بکەن ، وەکو لە سوورەتێکی تردا دەفەرموێ: (أو أمن أهل القرى أن يأتيهم بأسنا بياتا وهم نائمون، أو أمن أهل القرى أن ياتيهم بأسنا ضحى وهم يلعبون). ﴿[٤٧] أو يأخذهم على تخوف﴾ یان

لەکاتی ترس و چاوەڕوانی کردنی قاردا بیانگرێ ؟ ﴿فإن ربكم لرؤف رحيم﴾ جا بێگومان پەروەردگارتان لەگەڵ ئەو هەموو دەسەڵاتەدا زۆر بەسۆزو میهرەبانە، بۆیە پەلە ناکاو سزاتان دوا دەخات بۆ ڕۆژی خۆی، پێغەمبەریش دەفەرموێ: ((إن الله ليملى للظالم حتى إذا أخذه لم يفلته)) متفق عليه.

**هەموو شتێ سوژدە بۆ خوا دەبا :**

﴿[٤٨] أو لم يروا إلى ما خلق الله من شئ﴾ ئاخۆ ئەوانە تەماشای هەر شتێ لەدروستکراوەکانی خوایان نەکردووە (دارو درەخت و کێوو..هتد) ﴿يتفيؤا ظلاله عن اليمين والشمائل﴾ چۆن سێبەرەکەی لەڕاستەوە بۆ چەپ دەگەڕێ، جارێ زۆر دەبێ و، جارێکیش کەم دەبێتەوە ﴿سجدا لله﴾ کڕنووش و سوژدەش بۆ خوا دەبەن ؟ ﴿وهم داخرون﴾ لە حاڵێکدا ملکەچ و تەسلیمن بەدەسەڵاتی خوا ، واتە: هەموو بوونەوەر لەبەر دەستی دەسەڵاتی خوای گەورەدان و ، بیانەوێ، یان نەیانەوێ وجوودەکەیان شایەتی بوون و دەسەڵاتی بێ سنووری ئەو دەدەن ﴿[٤٩] ولله يسجد ما فى السموات وما فى الأرض من دابة والملائكة﴾ هەموو ئەو خزۆك و ڕەوەندانەی کە لەئاسمانەکان و زەویدان و، فریشتەکانیش بەهەمیشەیی سوژدە بۆ خوا دەبەن ﴿وهم لا يستكبرون﴾ و عەیبیشیان لێنایەو ، خۆ بەزلیش نازانن، لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: (ولله يسجد من فى السموات والأرض طوعا وكرها وظلالهم بالغدو والآصال). ﴿[٥٠] يخافون ربهم من فوقهم﴾ هەردەم لەدەسەڵات و قاری ئەوپەروەردگارەیان دەترسن لەسەرووییانەوە سزایان بۆ بنێرێ، ﴿ويفعلون ما يؤمرون﴾ و هەرشتێکیشیان پێ بسپێردرێ بێ ملەجەڕێ جێبە جێی دەکەن .

**دەبێ خوا بەتاك و تەنیا بپەرسترێ :**

﴿[٥١] وقال الله لا تتخذوا إلهين اثنين﴾ خوا دەفەرموێ: هەرگیز دوو خوا مەگرن و مەپەرستن ﴿إنما هو إله واحد﴾ چونکە بێگومان پەرستراوی ئێوە هەق هەر یەك پەرستراوی تاك و تەنیایە ﴿فإياى فارهبون﴾ جا کەواتە هەر لەمنیش شەرم بکەن و بترسن ﴿[٥٢] وله مافى السموات والأرض﴾ هەرشتێ لە ئاسمانەکان و زەویدا هەن هەرموڵکی ئەون ﴿وله الدين واصبا﴾ فەرمانبەرێتی بەپوختی هەرشایەنی ئەوە ﴿أفغير الله تتقون﴾ جا ئایا ئیتر ئێوە لەغەیری خوا دەترسن ؟ لە سوورەتێکی دیکەدا دەفەرموێ: (أفغير دين الله يبغون وله أسلم من فى السموات والأرض طوعا وكرها وإليه يرجعون) ﴿[٥٣] وما بكم من نعمة فمن الله﴾ هەر رزق و ڕۆزیی و نیعمەتێکتان هەبێ ، هەرلە لایەن خواوەیە ﴿[٥٤] ثم إذا مسكم الضر فإليه تجئرون﴾ دواییش ئەگەر تووشی هەر زیانێکیش بێن، هەر بۆلای ئەو هاوارو پەنا دەبەن و دەپاڕێنەوە ﴿ثم إذا كشف الضر عنكم﴾ پاشان هەر کە ئەو زیانەشتان لێ لا ببا ﴿إذا فريق منكم﴾ خێرا دەستەیەکتان ﴿بربهم يشركون﴾ شەریك و هاوەڵ بۆ پەروەردگاریان دائەنێن و! هەموو شتێکیان لەبیر دەچێتەوە ﴿[٥٥] ليكفروا بما آتيناهم﴾ هەر لەبەر ئەوە کە ناشکوری ئەو گشت نازو نیعمەتانە بکەن پێمان داون ﴿فتمتعوا فسوف تعلمون﴾ دەسا ڕابوێرن بۆ خۆتان، جادوایی زۆر ناخایەنێ دەزانن چیتان ئەوقە ئەبێت .

**بەشێکی بژێوییان دەدەنە بتەکان :**

﴿[٥٦] ويجعلون لما لا يعلمون نصيبا مما رزقناهم﴾ و لەو رزق و بژێویە پێمان دابوون بەشێکیان دادەنا بۆ ئەو بتانەی کەهیچ نازانن و، قازانج و سوودێکیشیان نیە ! ﴿تالله لتسألن عما كنتم تفترون﴾ وە سوێند بەخوا بەرامبەر ئەو درۆ هەڵبەستنەتان پرسیارتان لێ دەکرێت ﴿[٥٧] ويجعلون لله البنات﴾ وە بۆ خوا کچانیان دادەنا، واتە: وایان دەزانی فریشتەکان کچانی خوان !﴿سبحانه﴾ پاك و خاوێنی و بێخەوشیی لەو شتانە ئەوان دەیڵێن هەر بۆخوایە ﴿ولهم ما يشتهون﴾ بۆ خۆشیان ئەوی حەزیان لێ هەبوو دایان دەنا، واتە: کوڕ ، لە سوورەتێکی تردا بۆ سەر

زەنشتکردنیان دەفەرموێ: (ألكم الذكر وله الأنثى، تلك إذا قسمة ضيزى) یان دەفەرموێ: (ألا إنهم من إفكهم
لیقولون ولدالله وإنهم لكاذبون، أصطفى البنات على البنین، مالكم كیف تحكمون) ﴿٥٨ وإذا بشر احدهم بالأنثى﴾
هەر کاتێکیش مژدەو هەواڵی کچێ بەیەکێکیان بدرێ ﴿ظل وجهه مسودا﴾ دەبینی دەم و چاوی ڕەش هەڵ دەگەڕێ
﴿وهو كظيم﴾ دەروونیشی بەرامبەر بەخوا پڕە لە قارو ڕك و، پێیش دەخواتەوە خەریکە دەتەقێتەوە، هەر لەبەر ئەوە
کچی داوەتێ ! ﴿٥٩ یتوارى من القوم من سوء ما بشر به﴾ لە ناخۆشی و خراپی ئەو مژدەیەی پێی دراوە، لەخەڵك
خۆی دەشارێتەوەو، حەز ناکات بیبینن ﴿ايمسكه على هون﴾ نازانێ ئاخۆ لەسەر سووکیی و شەرمەزاری ڕای گرێ
و بەخێوی بکا ؟ ﴿أم يدسه في التراب﴾ یان بیخاتە ژێر خۆڵەوەو زیندە بەچاڵی بکات ؟ ﴿الا ساء ما يحكمون﴾ چاك
بزانن ! بڕیارێکی زۆر خراپ دەدەن کاتێ کیژ دەدەن
بەخواو، بۆ خۆیانیش کوڕ ! ﴿٦٠ للذين لا يؤمنون بالآخرة
مثل السوء﴾ بۆ ئەو کەسانەی کە بڕوایان بەڕۆژی دوایی
نیە، وێنەو سیفەتێکی خراپیان بۆ هەیە، واتە: حەزکردن لە
کوڕان و ڕکبوون لە کچان ﴿ولله المثل الأعلى﴾ خۆ مەسەل و
وەسفی بەرزو بڵندیش بۆ خوایە: (بێ نیازیی لە منال و
لەهەموو شتێك) ﴿وهو العزيز الحكيم﴾ هەر ئەویشە
بالادەست و دەسەڵاتدارو کار بەجێ و هەموو کارێکی
دروست و ڕەوایە. بەڵێ.. سووك و چرووك تەماشاکردنی
ژنان، وە نەبێ تەنها هەر لەناوعەرەبەکانی سەردەمی
نەفامییدا باوبووبێ، بەڵکو لەنێو ئەوانەیشدا کەخۆیان بە
پێشکەوتوو خاوەن شارستانیەت دەزانن، حاڵی ژنان لەلایان
کەمتر نیە لەوانەی سەردەمی نەفامیی کۆن، بۆیە دەڵێین هەر
ئیسلام بوو پلەو پایەو کەسێتی ژنانی بەرزکردەوەو،
گەیاندیە ئەو جێگایە کەپێغەمبەر ﷺ بفەرموێ: ((إنما
النساء شقائق الرجال))، وە بەسەدان وشەی جوان و
پرشنگداری تر، پلەو پایەی ئافرەت دەنرخێنێ و دەیخاتە
پاڵ پیاو، ئیسلام هەر کەهات ڕایگەیاندو فەرمووی: (ولهن مثل الذى عليهن بالمعروف) بەم وتەی پیرۆزەی خوایە
مافی ژنانی دیاری کردو نرخاندی، ئەمە بەو شێوەیە، لەولایشەوە لەپێش چاوی عەرەبەکانەوە پێغەمبەر ﷺ
دەستی خاتوو (فاتیمە)ی کچی دەگرت و ماچی دەکرد، لەکاتێکا کە ئەوان کچانیان زیندە بەچاڵ دەکرد، وە
هەروەها کاتێ خاتوو (فاتیمە) بهاتبا بۆلای پێغەمبەرﷺ لەبەری هەڵدەسایەوە، وەکاتێکیش لەسەفەر دەگەڕایەوە
سەردانی دەکرد.. بەلام بەداخەوە تا ئێستایش ژن وەکو پێویست نەگەیشتۆتە جێگەی شیاوی خۆی و، ئەو
یاسایانەش ئێستا باسی مافی ژنان دەکەن هەر لەسەر کاغەز ماونەتەوەو، موسڵمانانیش جۆرە بۆچوون و
تەسەورێکی تایبەتیان هەیە، خۆ ئەورووپاو وڵاتانی تریش لەپێش چاوەوەن کە چۆن ئافرەتیان کردووە بە بووکە
شووشە لەچێشتخانەو جێگا بازرگانیی و، گەشت و گەڕانەکاندا بەوێنەو نیگار دەیرازێننەوە، وە چۆن لە

الجزء الرابع عشر — سورة النحل

لِيَكْفُرُوا۟ بِمَآ ءَاتَيْنَـٰهُمْ ۚ فَتَمَتَّعُوا۟ ۖ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٥٥﴾ وَيَجْعَلُونَ
لِمَا لَا يَعْلَمُونَ نَصِيبًا مِّمَّا رَزَقْنَـٰهُمْ ۗ تَٱللَّهِ لَتُسْـَٔلُنَّ عَمَّا كُنتُمْ
تَفْتَرُونَ ﴿٥٦﴾ وَيَجْعَلُونَ لِلَّهِ ٱلْبَنَـٰتِ سُبْحَـٰنَهُۥ ۙ وَلَهُم مَّا يَشْتَهُونَ
﴿٥٧﴾ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِٱلْأُنثَىٰ ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ
﴿٥٨﴾ يَتَوَٰرَىٰ مِنَ ٱلْقَوْمِ مِن سُوٓءِ مَا بُشِّرَ بِهِۦٓ ۚ أَيُمْسِكُهُۥ عَلَىٰ هُونٍ
أَمْ يَدُسُّهُۥ فِى ٱلتُّرَابِ ۗ أَلَا سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴿٥٩﴾ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ
بِٱلْـَٔاخِرَةِ مَثَلُ ٱلسَّوْءِ ۖ وَلِلَّهِ ٱلْمَثَلُ ٱلْأَعْلَىٰ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ
﴿٦٠﴾ وَلَوْ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِظُلْمِهِم مَّا تَرَكَ عَلَيْهَا مِن دَآبَّةٍ وَلَـٰكِن
يُؤَخِّرُهُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ۖ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ لَا يَسْتَـْٔخِرُونَ
سَاعَةً ۖ وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ ﴿٦١﴾ وَيَجْعَلُونَ لِلَّهِ مَا يَكْرَهُونَ
وَتَصِفُ أَلْسِنَتُهُمُ ٱلْكَذِبَ أَنَّ لَهُمُ ٱلْحُسْنَىٰ ۖ لَا جَرَمَ أَنَّ
لَهُمُ ٱلنَّارَ وَأَنَّهُم مُّفْرَطُونَ ﴿٦٢﴾ تَٱللَّهِ لَقَدْ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰٓ أُمَمٍ مِّن
قَبْلِكَ فَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَـٰنُ أَعْمَـٰلَهُمْ فَهُوَ وَلِيُّهُمُ ٱلْيَوْمَ وَلَهُمْ
عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦٣﴾ وَمَآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ إِلَّا لِتُبَيِّنَ لَهُمُ
ٱلَّذِى ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ ۙ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٦٤﴾

٢٧٣

مەلەوانگەکاندا لەزەتی لێ وەردەگیردرێ، وە لەهوتێل و موتێلەکاندا چۆن پرو پاڵانتە بڵاو دەکرێتەوە بە وێنەی ئافرەتەوە بۆ پێشکەشکردنی خزمەتی میوانەکانیان ؟! دەخوازم دەستەیەکی پسپۆرو خاوەن ویژدان دابنرێن بۆ توێژینەوەو لێکۆڵینەوە لەمافی ژنان و مەسەلە گرنگەکانی ژنان لەئیسلامدا، هەتا بەکوێرانە، وەیان بە نەزانین، وەیان بە دوژمنایەتیی موسڵمانان لێرەو لەوێ و ئیسلامیش تاوانبار نەکرێ.

## بەزوویی خواگیر نابن :

﴿٦١ ولو يؤاخذ الله الناس بظلمهم﴾ ئەگەر بەهۆی ستەم و لە سنوور دەرچوونەوە خوای کارجوان خەڵکان بگرێ ﴿ماترك عليها من دابة﴾ ئەوا هیچ ڕەوەندەو گیانلەبەرێکی بەسەر زەویەوە نەدەهێشت، چونکە بەرامبەر فەرمان و نیعمەتەکانی خوا مرۆڤ بە سروش لارو لاسارە ﴿ولكن يؤخرهم إلى أجل مسمى﴾ بەڵام هەتا ئاکامێکی دیارییکراو بۆیان، دوایان دەخاو دەیان هێڵێتەوە ﴿فإذا جاء اجلهم لايستأخرون ساعة ولايستقدمون﴾ ئینجا کە ئاکامیشیان هات، تەنها ساتێك پاش و پێش ناکەن لێی ﴿٦٢ ويجعلون لله ما يكرهون﴾ وەهەرشتێ خۆیان پێیان ناخۆشەو حەزی لێ ناکەن دایدەنێن بۆخواو دەیکەنە هاوبەشیی، ئەوەتا بڕیاری کچ دەدەن بۆ خوا، کەچی خۆشیان لێی ڕائەکەن ! ئەوەتە شەریکی بۆ دادەنێن ، کەچی خۆیان لە شەریك رادەکەن ! ﴿وتصف السنتهم الكذب﴾ لەگەڵ ئەوەیشدا زمانیان گۆ بەدرۆ دەکاو دەڵێت: ﴿أن لهم الحسنى﴾ کە پاشە ڕۆژی چاك و باش – بە بۆچوونی خۆیان – هەر بۆ ئەوانە ! ﴿لاجرم أن لهم النار﴾ بێگومان ئەو قسەیانە وانیە، بۆ ئەوان هەر ئاگری دۆزەخ هەیە ، نەك پاشەڕۆژی چاك وەك خۆیان دەڵێن ﴿وانهم مفرطون﴾ سەرەڕای ئەوەیش پێشی خەڵکانی تر دەخرێن و بەپەلە ڕەوانەی دۆزەخ دەکرێن و، لەوێ بێ سەرو شوێن دەبن و لەبیر دەکرێن ﴿٦٣ تالله لقد أرسلنا إلى أمم من قبلك﴾ سوێند بەخوا بەر لەتۆیش گەلێ پێغەمبەرمان ناردە لای چەند هۆزو نەتەوەیەك ، بۆڕێنمایی و شارەزاکردنیان لەڕێی ڕاست ﴿فزين لهم الشيطان أعمالهم﴾ جا شەیتان کاروکردەوە خراپەکانیانی لا شیرین کردن ، بەرهەڵستی پەیامبەرەکان وەستان ﴿فهو وليهم اليوم﴾ جا ئەمڕۆش، واتە: لە دنیادا هەر ئەوە دۆست و یارمەتیدەریان، دیارە کە شەیتانیش چ یارمەتیدەرێکی نالەبارو خراپە ﴿ولهم عذاب اليم﴾ و لە ڕۆژی قیامەتیشدا سزایەکی ئێش پێگەیەنەریشیان بۆ هەیە و، ڕزگاریان نابێت لێی ﴿٦٤ وما انزلنا عليك الكتاب إلا لتبين لهم الذى اختلفوا فيه﴾ وە ئێمە ئەم قورئانەشمان هەر بۆ ئەوە نارد بۆت ئەی پێغەمبەر! ﷺ بۆ ئەوەی هەرچی جیاوازیی و ئیختیلافیان تێیدا هەیە بۆیانی ڕۆشن بکەیتەوە ﴿وهدى ورحمة لقوم يؤمنون﴾ وە ببێتە ڕێ نیشاندان و، ڕەحمەت و میهرەبانی بۆ گەل و هۆزێ بییەوێ ئیمان بهێنێ ﴿٦٥ والله انزل من السماء ماء﴾ و خوا لە ئاسمانەوە بەدەسەڵاتی خۆی ئاوی باراندە خوارێ ﴿فأحيا به الأرض بعد موتها﴾ ئینجا زەویی، دوای مردنیی و وشك بوونیی پێ زیندوو کردەوەو بووژاندەوە ، واتە: هەر وەکو بەباران زەویی دەبزوێ و وەبەردێت، هەر ئاوایش دڵەکان بە قورئان دەبزوێن و وەبەردێن ﴿إن فى ذلك لآية﴾ بێگومان لەوەدا بەڵگەیەکی گەورەو مەزن هەیە لەسەر بوون و یەکخواپەرستی ﴿لقوم يسمعون﴾ بۆ ئەوخەڵکانە کە گوێ بۆ وتەی ڕاست و دروست بگرن ، لەماناو مەبەستی قسە تێ بگەن.

## لەم وڵساتانە پەند بگرن :

﴿٦٦ وإن لكم فى الأنعام لعبرة﴾ بە ڕاستیی لە دروستکردنی مەڕو بزن و وشترو گادا پەندو ئامۆژگاریی گەورە هەیە بۆتان، دەتوانن زۆر بەئاسانی خوای کارزانی پێبدۆزنەوە ﴿نسقيكم مما فى بطونه من بين فرث ودم لبنا خالصا﴾ لە نێوان سڕوانی ناوسکیان و ، لە نێوان خوێندا شیرێکی پاك و خاوێنتان پێ دەنۆشین ﴿سائغا

﴿للشاربین﴾ خۆشمەزەو خۆشقووتە بۆ نۆشێنەران، واتە: زۆر بەئاسانیی و سادە دەخورێتەوەو دەچێتە خواریٚ ﴿٦٧
ومن ثمرات النخیل والأعناب تتخذون منه سكرا ورزقا حسنا﴾ وە لە بەرو میوەی داری خورماو ترێدا عەرەق و، رزق و رۆزییەکی چاك و پاك وەردەگرن و، واتە: ئەوەی حەلاڵە لێیان وەکو سرکەو مێوژو..هتد شەرابیشی لیٚ دروست ئەکەن، باشە! پاش ئەو نیعمەتانە ئیدی شەرم ناکەن لاڕیٚ دەگرن ؟. (ئیبن عەباس) دەڵیٚ: دیارە ئەمە پێش یاساغبوونی شەرابە ﴿إن فی ذلك لآیة لقوم یعقلون﴾ بێگومان لەوەدا بەڵگەو نیشانەیەکی گەورە هەیە بۆ هەر خەڵکیٚ تیٚ بگاو، دەرکی هەبیٚ بۆ دۆزینەوەی خوای تاك وتەنیا.

**تێبینی:** ئەم ئایەتە یەکەم ئایەت بوو دابەزی کەزەمی عەرەق بکات.

الجزء الرابع عشر — سورة النحل

وَٱللَّهُ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَآ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّقَوْمٍ يَسْمَعُونَ ﴿٦٥﴾ وَإِنَّ لَكُمْ فِى ٱلْأَنْعَٰمِ لَعِبْرَةً نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِى بُطُونِهِۦ مِنۢ بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ لَّبَنًا خَالِصًا سَآئِغًا لِّلشَّٰرِبِينَ ﴿٦٦﴾ وَمِن ثَمَرَٰتِ ٱلنَّخِيلِ وَٱلْأَعْنَٰبِ تَتَّخِذُونَ مِنْهُ سَكَرًا وَرِزْقًا حَسَنًا إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٦٧﴾ وَأَوْحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحْلِ أَنِ ٱتَّخِذِى مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا وَمِنَ ٱلشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ ﴿٦٨﴾ ثُمَّ كُلِى مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ فَٱسْلُكِى سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلًا يَخْرُجُ مِنۢ بُطُونِهَا شَرَابٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ فِيهِ شِفَآءٌ لِّلنَّاسِ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٦٩﴾ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ ثُمَّ يَتَوَفَّىٰكُمْ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰٓ أَرْذَلِ ٱلْعُمُرِ لِكَىْ لَا يَعْلَمَ بَعْدَ عِلْمٍ شَيْـًٔا إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ قَدِيرٌ ﴿٧٠﴾ وَٱللَّهُ فَضَّلَ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ فِى ٱلرِّزْقِ فَمَا ٱلَّذِينَ فُضِّلُوا۟ بِرَآدِّى رِزْقِهِمْ عَلَىٰ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُمْ فَهُمْ فِيهِ سَوَآءٌ أَفَبِنِعْمَةِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴿٧١﴾ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا وَجَعَلَ لَكُم مِّنْ أَزْوَٰجِكُم بَنِينَ وَحَفَدَةً وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ أَفَبِٱلْبَٰطِلِ يُؤْمِنُونَ وَبِنِعْمَتِ ٱللَّهِ هُمْ يَكْفُرُونَ ﴿٧٢﴾

٢٧٤ — وَيَعْبُدُونَ مِن

## مێشەنگ و هەنگوێن بۆ رادەمێنان نیشانن:

﴿٦٨ واوحی ربك إلى النحل﴾ پەروەردگاری تۆ بە ئیلهام، رێنمایی میشهەنگوێنی کرد ﴿ان اتخذی من الجبال بیوتا ومن الشجر ومما یعرشون﴾ کە بچۆ لەنێو تلە بەردی شاخەکانداو، لەناو دارانداو لەو هەرزاڵ و خانەوانەشدا خەڵك بۆت دروست دەکەن، جێی ژین و ژیواری خۆت سازبدە ﴿٦٩ ثم کلی من کل الثمرات﴾ پاشان بچۆ لەهەر گوڵ و میوەیەك بژیویت بخۆ (بمژە) ﴿فاسلکی سبل ربك ذللا﴾ جا بەئاسانی بەو ڕێگانەدا بڕۆ کە پەروەردگارت بۆی دەست نیشان کردوی بۆ مژینی شیلەی گوڵەکان ﴿یخرج من بطونها شراب مختلف الوانه﴾ لە نێو سکیی مێشهەنگەکاندا خواردنەوەیە (هەنگوێن)ێکی نایاب و هەمەڕەنگ دێتە دەریٚ ﴿فیه شفاء للناس﴾ شفای گەلیٚ نەخۆشیی تێدایە بۆمەردم ﴿إن فی ذلك لآیة لقوم یتفکرون﴾ بەڕاستیی لەوەشدا بەڵگەو نیشانەیەکی ئێجگار گەورە هەیە بۆ گەلیٚ رابمێنیٚو بیر بکاتەوە لەدەسەلاٚتی خوای گەورە" بیر بکاتەوەو بڵیٚ باشە! ئەو مێش هەنگوێنە چۆن دەزانیٚ و کیٚ فێری کرد ئەو شەش پاڵووە بەو شێوەیە رێك بخات کە تا ئێستاش ئەندازیاران سەریان لیٚ سور دەمێنیٚ. (ئەبوو سەعیدی خودریی) دەڵێت: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ گوتی: براکەم زکی دەچێت؟ فەرمووی: دەبچۆ هەنگوێنی بدەریٚ، ئەویش چوو هەنگوێنی دایەو چاك نەبوو! دووبارەو سێبارە پیاوەکە چوو و هاتەوە لای پێغەمبەر هەر گوتی: ئاخر پێمداو چاك نەبوو! ئەویش ﷺ فەرمووی: ((صدق الله وکذب بطن أخیك)) بیٚ سۆ خوا راست دەکاو زکی براکەی تۆ درۆ دەکات، دەبچۆ هەنگوێنی بدەریٚ، ئەویش چوو و دیسان هەنگوێنی دایەو چاکەوە بوو/ فتح الباری: کتاب الطب : ١٠ /١٦٨، مسلم، کتاب السلام: ١٧٣٦-١٧٣٧. ﴿٧٠ والله خلقکم ثم یتوفاکم﴾ و خوا ئێوەی دروستکرد، پاشانیش هەرکە ئاکامتان هات ئەتانمرێنیٚ ، لەجێیەکی تردا دەفەرمویٚ: (الله الذی خلقکم من ضعف ثم جعل من بعد ضعف قوة..)﴿ومنکم من یرد إلى ارذل العمر﴾ هەیشتانە ئەیباتەوە بۆ تەمەنێکی زۆر کەنەفتو پەککەوتەو، هیچ بیرو

هۆشێكی لانامێنێ و، گەلێ جار قسەی بێ جێش لە زاری دەردەچێ و، دەكەوێتە ورێنە ﴿لكي لا يعلم بعد علم شيئا﴾ تا دەرەنجام پاش بە ئاگایی و زانین، هەموو شتێكی لەبیر دەچێتەوەو، هیچ شتێك نازانێ و: وەك منداڵی لێدێتەوە، پێغەمبەری خوا زۆرجار دەیفەرموو: ((اللهم! إني أعوذ بك من البخل والكسل والهرم، و أرذل العمر وعذاب القبر، وفتنة الدجال وفتنة المحيا والممات ..)) بوخاریی.﴿إن الله عليم قدير﴾ بەڕاستیی خوا زۆر زانایە بە هەڵسووڕاندنی كارو باری بەندەكانی، زۆریش دەسەڵاتدارو بەتوانایە، مەیلی لەكردنی هەرشتێك ببێت بەئاسانی دەیكات ﴿[٧١] والله فضل بعضكم على بعض في الرزق﴾ و خوا فەزڵی هەندێكتانی داوە بەسەر هەندێكتانا، لە رزق و ڕۆزیدا ، لەبەر هەر حیكمەت و بەرژەوەندییەك خۆی دەیزانێ، ئەوە هەژارەو، ئەوە دەوڵەمەندو پاشایە ! ﴿فما الذين فضلوا برادي رزقهم على ماملكت أيمانهم فهم فيه سواء﴾ كەچی ئەوانەی سەرخراون و، رزق و ڕۆزی باش و فرەیان پێدراوە، واتە: ئاغاكان، ئامادەنین بەشی بەندەكانیانی لێ بدەن و ئیدی هەموو وەكو یەك شەریك و بەشدار بن ، واتە: گەورەو سەرداران لەو سامانەدا كە خوا پێیداون ئامادەنین بەندەكانیان بكەنە هاوبەشی خۆیان، جا ئیتر چۆن دەبێ ئەوان بتەكان و هەندێ لە دروستكراوەكان بكەنە شەریك و هاوبەشی خوا لە پەرستندا ؟! لە ئایەتێكی تردا هەر لەو بارەیەوە دەفەرموێ: (ضرب لكم مثلا من أنفسكم هل لكم من ما ملكت أيمانكم من شركاء في ما رزقناكم فأنتم فيه سواء تخافونهم كخيفتكم أنفسكم..) .﴿افبنعمة الله يجحدون﴾ جا ئایا نكووڵی نیعمەت و بەخششی خوا دەكەن و، هاوەڵیی بۆ دادەنێن ؟! واتە: ئایا ئێوە چۆن بەشتێ قایەل دەبن بۆ خوا، كەچی بۆ خۆتان قایل نین پێی ؟! رازی نابن بەندەكانتان ببنە هاوبەشتان، ئەی باشە ! چۆن ئەوبتانە دەكەنە هاوبەش بۆ خوا !.

**لە بەڵگەو بەخششەكانی خوایە ژن و پیاوو كوڕو نەوە :**

﴿[٧٢] والله جعل لكم من انفسكم ازواجا﴾ وەخوا هەر لە جنسی خۆتان هاو لف و هاوسەری دانێ، خۆ ئەر لەخۆتان نەبووبا، وەكو ئێستا ئولفەت و پەیوەندی باشتان نەدەبوو و ژیانتان سەری نەدەگرت ﴿وجعل لكم من أزواجكم بنين وحفدة﴾ وە لەو هاولف و هاوسەرانەدا كوڕەزاو نەوەی پێ بەخشین ﴿ورزقكم من الطيبات﴾ و لە رزق و ڕۆزی پاك و حەڵاڵیشی پێدان ﴿افبالباطل يؤمنون﴾ جا ئایا بتپەرستەكان - دوای ئەو هەموو نیعمەت و بەهرانە- بە پڕو پووچ و باتڵ بڕوا دەكەن ؟! ﴿وبنعمة الله هم يكفرون﴾ و بەو گشت بەهرەو بەخششەی خوا باوەڕ ناكەن و ناسوپاسی دەكەن ؟!. لە قیامەتدا خوا لەبەرامبەر ئەو نیعمەتانەوە بەمرۆڤەكان دەفەرموێ: ((ألم أزوجْك؟ ألم أكرمْك؟ ألم أسخر لك الخيل والإبل، وأذَرْك ترأس و تربع؟)) موسلیم:٢٢٧٩/٤. واتە: ئەرێ هاوسەرم نەدایتێ ؟ ئەرێ ئەسپ و ماین و وشترم بۆ رامنەكردیت ؟ ئەرێ ئازادم نەكردیت سەرداریی خۆت و خانەولانەی خۆت بكەیت ؟. ﴿[٧٣] ويعبدون من دون الله مالايملك لهم رزقا من السموات والأرض شيئا﴾ و ئەوانە لەباتی خوای كارزان شتێك دەپەرستن كە لە ئاسمانەكان و زەوییدا دەسەڵاتی هیچ جۆرە رزق و ڕۆزییەكیان نییە بۆیان ﴿ولايستطيعون﴾ و ناشتوانن باران ببارێنن ، یان دارو درەختیان بۆ سەوز بكەن، كەچی هەردەیان دەپەرستن ! ﴿[٧٤] فلا تضربوا لله الأمثال﴾ جا ئیتر ئێوە نموونەو شەریك بۆ خوا مەهێننە ئاراوە، چونكە ئەو بێ شەریك و بێ وێنەیە ﴿إن الله يعلم وانتم لا تعلمون﴾ بەڕاستیی خوا پووچەڵی ئەوەی دەیكەن دەیزانێ، وەئێوە بێ ئاگان و نازانن.

**نموونەی موسڵمان و كافر، یان بت و خوا :**

لێرەدا خوای كارجوان نموونەی مرۆڤی موسڵمان و بێ باوەڕ دێنێتەوەو دەفەرموێ: ﴿[٧٥] ضرب الله مثلا عبدا مملوكا لايقدر على شئ﴾ خوا مەسەل و نموونە - بۆ خۆی و بۆ ئەو بتانە دێنێتەوە ئەیانكەنە هاوبەش بۆی- بە

بەندەیەك كە توانای هیچ شتێكی نەبێت ﴿ومن رزقناه منا رزقا حسنا﴾ و بەكەسێكی خاوەن باوەڕی وایش كەڕزق و ڕۆزییەكی چاك و پاكی داوەتێ ﴿فهو ینفق منه سرا وجهرا﴾ جائەو دەسەڵاتدارەیان بە نهێنی و بەئاشكرا لێی دەبەخشێت ودەستی هەر لەخێردایە، ئەوی دیكەش ، واتە: هیچ لێنەهاتووەكە- بێ خێروبێر لێی وەستاوەو هیچی لێناوەشێتەوە ﴿هل یستوون﴾ ئاخۆ ئەو دووكەسە وەكو یەكن ؟ ﴿الحمد لله﴾ سوپاس بۆ خوا كە هەق و ڕاستیی دەركەوت ﴿بل اكثرهم لا یعلمون﴾ بەڵام زۆربەیان ئەم حەقیقەت و ڕاستیانە نازانن ، بۆیە دروستكراوو دروستكەر وەكو یەك تەماشا دەكەن !! ﴿[٧٦] وضرب الله مثلا رجلین﴾ خوا بەدوو پیاو دەربارەی هەق و ناهەق مەسەل و نموونەیەك دەهێنێتەوە ﴿احدهما ابكم لا یقدر علی شئ﴾ یەكێكیان لاڵەو، توانای هیچ شتێكی نیە، تاكارێكی



وَيَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَمۡلِكُ لَهُمۡ رِزۡقٗا مِّنَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلۡأَرۡضِ شَيۡـٔٗا وَلَا يَسۡتَطِيعُونَ ﴿٧٣﴾ فَلَا تَضۡرِبُواْ لِلَّهِ ٱلۡأَمۡثَالَۚ
إِنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٧٤﴾ ۞ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا عَبۡدٗا
مَّمۡلُوكٗا لَّا يَقۡدِرُ عَلَىٰ شَيۡءٖ وَمَن رَّزَقۡنَٰهُ مِنَّا رِزۡقًا حَسَنٗا
فَهُوَ يُنفِقُ مِنۡهُ سِرّٗا وَجَهۡرًاۖ هَلۡ يَسۡتَوُۥنَۚ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِۚ
بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٧٥﴾ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلٗا رَّجُلَيۡنِ
أَحَدُهُمَآ أَبۡكَمُ لَا يَقۡدِرُ عَلَىٰ شَيۡءٖ وَهُوَ كَلٌّ عَلَىٰ
مَوۡلَىٰهُ أَيۡنَمَا يُوَجِّههُّ لَا يَأۡتِ بِخَيۡرٍ هَلۡ يَسۡتَوِي هُوَ وَمَن
يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَهُوَ عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٧٦﴾ وَلِلَّهِ غَيۡبُ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَمَآ أَمۡرُ ٱلسَّاعَةِ إِلَّا كَلَمۡحِ ٱلۡبَصَرِ
أَوۡ هُوَ أَقۡرَبُۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿٧٧﴾ وَٱللَّهُ
أَخۡرَجَكُم مِّنۢ بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا وَجَعَلَ
لَكُمُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ وَٱلۡأَفۡـِٔدَةَ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ
﴿٧٨﴾ أَلَمۡ يَرَوۡاْ إِلَى ٱلطَّيۡرِ مُسَخَّرَٰتٖ فِي جَوِّ ٱلسَّمَآءِ
مَا يُمۡسِكُهُنَّ إِلَّا ٱللَّهُۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴿٧٩﴾



خێری لێبووەشێتەوە ﴿وهو كل علی مولاه﴾ و پەككەوتەو سەر باری ئاغاكەیەتی ﴿اینما یوجهه لایأت بخیر﴾ بە هەر لایەكا بینێرێ ، خێرێك بەدەست ناهێنێت ﴿هل یستوی هو ومن یأمر بالعدل وهو علی صراط مستقیم﴾ ئاخۆ كەسێكی لاڵی هیچ لێنەهاتووی ئاواو، كەسێكیش بەردەوام فەرمان بەدادگەریی بداو لەسەر ڕاستە ڕێیش بێ ، وەكو یەك وابن؟! دیارە هەرگیز وەكو یەك نین، جا باشە ئەی چۆن ئێوە بتان دەكەنە شەریك و هاوبەشی خوا ؟!

**زانینی هەمو نادیارێك و هاتنی ڕۆژی پەسڵان بۆ خوایە :**

﴿[٧٧] ولله غیب السموات والأرض﴾ زانینی كاروباری هەموو نادیارێك لە ئاسمانەكان و زەوییدا، هەر بۆ خوایە، هەر ئەو دەزانێ چۆنەو، كەی دەبێت ﴿وما أمر الساعة إلا كلمح البصر أوهو أقرب﴾ و هاتنی ڕۆژی قیامەتیش هێندە ئاسانەو خێرایە هەر بەقەد چاو تروكانێكە، یان لەخێراییدا لەوەیش نزیكترە، چونكە تەنها هەر ئەوەندەیە كەخوا پێی بفەرموێ ببە، ئەوجا دەست بەجێ دەبێت.. جا ئەوكاتە ئەو ڕۆژەهات، ئیتر هەق و ناهەق ڕوونتر دەرئەكەوێ، لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێ: (وماأمرنا إلا واحدة كلمح بالبصر) ﴿إن الله علی كل شئ قدیر﴾ بەڕاستیی خوا بەسەر هەمووشتێكا بەقیامەتیشەوە هێزو دەسەڵاتی هەیەو هیچ شتێك ناتوانێ بەر هەڵستی بكات ، یان ئەم ئایەتە دەفەرموێ: (ماخلقكم ولا بعثكم إلا كنفس واحدة) ﴿[٧٨] والله أخرجكم من بطون أمهاتكم لا تعلمون شیئا﴾ خوا ئێوەی لەپزدانی دایكتانا وەدەرهێنا، كەچی ئەوكاتە هیچ شتێكتان نەدەزانی ﴿وجعل لكم السمع والأبصار والأفئدة﴾ و گوێ و چاوو دڵی پێدان ، هەتا بە ژیرانە بیربكەنەوە ﴿لعلكم تشكرون﴾ بەشكو شوكرانە بژێری بن و، بەباشی خوا بناسن، ئەم ئایەتەی: (قل هوالذی أنشأكم وجعل لكم السمع والأبصار والأفئدة قلیلا ماتشكرون) هەر بۆ سەلماندنی ئەو ڕاستیەیە ﴿[٧٩] الم یروا إلی الطیر مسخرات فی جو السماء﴾ ئاخۆ سەیری باڵندەیان نەكردبێت، كە چۆن لەكەش و هەوای ئاسماندا ڕامكراون بۆ فڕین و گەڕان ﴿ما یمسكهن إلا الله﴾ دیارە كەخوا نەبێ كێ دەتوانێ

ئەوانە ڕابگرێ، بەتایبەت کاتێ باڵەکانیان بڵاودەکەنەوەو، کاتێکیش بەخۆیانیانەوە دەنووسێنن ﴿إن في ذلك لآيات لقوم يؤمنون﴾ کە بێگومان لەوشتانەدا چەندین بەڵگەو نیشانە هەیە بۆ گەلێ باوەڕ بێنێ.

**خانوو و کاڵا و کەل و پەل هەموو نیعمەتی خوان :**

﴿٨٠ والله جعل لكم من بيوتكم سكنا﴾ خوا لە ماڵ و خانووەکانتاندا حەوانەوەو سوکناگەی بۆدانـاون، بەتایبەت ئەوانەتان گەشتیارو کۆچەری نین ﴿وجعل لكم من جلود الأنعام بيوتا﴾ وە لەپێستی ئاژەڵ (مەڕو بزن و وشترو گا)یش خانووی بۆ فەراهەم هێناون، واتە: لەموو و کورك و خوری و بەرگن ، چادرو جۆرەها نیشتگای تری لێ دروست دەکەن بۆ حەوانەوەتان ﴿تستخفونها يوم ظعنكم ويوم إقامتكم﴾ کە لە ڕۆژی بارکردن و لەکاتی مانەوەشتاندا، سووك و ئاسان هەڵدەسن و ئەم لا بۆ ئەولا دەگوێزنەوە ﴿ومن اصوافها واوبارها واشعارها اثاثا﴾ وە لە خوری مەڕەکان و، کورکیی وشترەکان و، مووی بزنەکان، ڕایەخ و جل و بەرگ و.. کاڵاو ناوماڵ دەستدەخەن ﴿ومتاعا إلى حين﴾ وە تا کاتێکی دیاریکراو, کەڵکی تریان لێ وەردەگرن ، دەسا بۆ شوکری خوا ناکەن؟ ﴿٨١ والله جعل لكم مما خلق ظلالا﴾ و لەو شتانەدا خوا بۆی دروستکردوون ، سێبەرگەلێکی بۆ بەدیهێناون تا لە گەرما خۆتانی پێ بپارێزن ﴿وجعل لكم من الجبال اكنانا﴾ و لە کێوەکانیشدا گەلێ پەناگاو جێگای پەسێوی وەك کەورگ و ئەشکەوت و ..هتد بۆ داناون ﴿وجعل لكم سرابيل تقيكم الحر﴾ و جلك و پۆشاکێکی بۆداهێنان کە لەکاتی گەرماو سەرمادا دەتانپارێزێ ﴿وسرابيل تقيكم بأسكم﴾ وە جلکێك- زرێی جەنگی- کە لە زەبری جەنگ لەگەڵ یەکتردا دەتانپارێزێ ﴿كذلك يتم نعمته عليكم﴾ ئا بەو شێوەیە خوا بەخشش و نیعمەتی خۆی تەواو دەکا بۆتان ﴿لعلكم تسلمون﴾ بەشکو باشتر ملکەچی فەرمانەکانی ببن و یەکلا ببنەوە بۆی ﴿٨٢ فإن تولوا فإنما عليك البلاغ المبين﴾ ئینجا ئەگەر پاش ئەو هەموو هەوڵ و ڕوونکردنەوەیە، هەر ڕوویان لەباوەڕ هێنان وەرگێڕا، نیگەران مەبە، چونکە تۆ تەنها گەیاندنێکی ئاشکراو نمایانت لەسەرە ﴿٨٣ يعرفون نعمة الله ثم ينكرونها﴾ نیعمەت و بەخششی خوا دەناسن و، پاشانیش نکوولیی دەکەن ﴿واكثرهم الكافرون﴾ و زۆربەشیان کافرو بێ باوەڕن !

وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنۢ بُيُوتِكُمۡ سَكَنٗا وَجَعَلَ لَكُم مِّن جُلُودِ
ٱلۡأَنۡعَٰمِ بُيُوتٗا تَسۡتَخِفُّونَهَا يَوۡمَ ظَعۡنِكُمۡ وَيَوۡمَ إِقَامَتِكُمۡ
وَمِنۡ أَصۡوَافِهَا وَأَوۡبَارِهَا وَأَشۡعَارِهَآ أَثَٰثٗا وَمَتَٰعًا إِلَىٰ حِينٖ
٨٠ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّمَّا خَلَقَ ظِلَٰلٗا وَجَعَلَ لَكُم
مِّنَ ٱلۡجِبَالِ أَكۡنَٰنٗا وَجَعَلَ لَكُمۡ سَرَٰبِيلَ تَقِيكُمُ
ٱلۡحَرَّ وَسَرَٰبِيلَ تَقِيكُم بَأۡسَكُمۡۚ كَذَٰلِكَ يُتِمُّ نِعۡمَتَهُۥ
عَلَيۡكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تُسۡلِمُونَ ٨١ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّمَا عَلَيۡكَ
ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ٨٢ يَعۡرِفُونَ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُنكِرُونَهَا
وَأَكۡثَرُهُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ٨٣ وَيَوۡمَ نَبۡعَثُ مِن كُلِّ أُمَّةٖ
شَهِيدٗا ثُمَّ لَا يُؤۡذَنُ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ وَلَا هُمۡ يُسۡتَعۡتَبُونَ
٨٤ وَإِذَا رَءَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلۡعَذَابَ فَلَا يُخَفَّفُ عَنۡهُمۡ وَلَا هُمۡ
يُنظَرُونَ ٨٥ وَإِذَا رَءَا ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْ شُرَكَآءَهُمۡ
قَالُواْ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ شُرَكَآؤُنَا ٱلَّذِينَ كُنَّا نَدۡعُواْ مِن دُونِكَۖ
فَأَلۡقَوۡاْ إِلَيۡهِمُ ٱلۡقَوۡلَ إِنَّكُمۡ لَكَٰذِبُونَ ٨٦ وَأَلۡقَوۡاْ
إِلَى ٱللَّهِ يَوۡمَئِذٍ ٱلسَّلَمَۖ وَضَلَّ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ ٨٧




**حاڵی موشریکان لەڕۆژی حەشردا :**

﴿٨٤ ويوم نبعث من كل امة شهيدا﴾ ئەی پێغەمبەر! هەموو کافرێك وریا بکەرەوە لە ڕۆژێ کە لەهەموو ئوممەت و نەتەوەیەك ئاگادارو شایەتێك (پەیامبەرێك) دێنین، هەتا شایەتی لەسەر شێوەی وەڵامدانەوەیان بدا ﴿ثم لا يؤذن للذين كفروا﴾ لە پاشان مۆڵەتی قسەو پاڕانەوە بەکافرو بێ بڕوایان نادرێت ﴿ولا هم يستعتبون﴾ و داوای ڕەزایەت

خوازیشیان لێ ناكرێ بۆ بڕو بیانوو هێنانەوەو خوا لەخۆ ڕازی كردن ، چونكە دیارە كەدرۆ دەكەن، لە جێگایەكی تردا دەفەرموێ: (هذا یوم لاینطقون، ولا یؤذن لهم فیعتذرون) ﴿[85] وإذا رای الذین ظلموا العذاب﴾ كاتێ كە ستەمكارەكان جەزرەبەو سزای دۆزەخ دەبینن ﴿فلا یخفف عنهم ولاهم ینظرون﴾ ئیتر نەسزایان لێ كەم دەكرێتەوەو، نە مۆڵەتیش دەدرێن بۆ كاتێكی تر، بەڵكو بەپەلە دەیانفڕێنن بۆناو ئاگر، چونكە ئاكامیان ئاشكرایە ﴿[86] وإذا رای الذین اشركوا شركاءهم﴾ جا كە هاوبەشدانەران چاویان بە پەرسراوو هاوبەشەكانیان دەكەوێت ﴿قالوا ربنا هؤلاء شركاؤنا الذین كنا ندعوا من دونك﴾ دەڵێن: ئەی پەروەردگاری ئێمە!! ئەمانەن هاوبەشەكانمان– كە لەدونیادا– لەباتی تۆ هاوارمان بۆ دەبردن و دەمانپەرستن، دیارە ئەمە پێ لێنانە بەتاوانەكانی خۆیان و داوای سوككردنی

سورة النحل — الجزء الرابع عشر

ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ زِدۡنَٰهُمۡ عَذَابٗا فَوۡقَ
ٱلۡعَذَابِ بِمَا كَانُواْ يُفۡسِدُونَ ﴿٨٨﴾ وَيَوۡمَ نَبۡعَثُ فِي كُلِّ
أُمَّةٖ شَهِيدًا عَلَيۡهِم مِّنۡ أَنفُسِهِمۡۖ وَجِئۡنَا بِكَ شَهِيدًا عَلَىٰ
هَٰٓؤُلَآءِۚ وَنَزَّلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ تِبۡيَٰنٗا لِّكُلِّ شَيۡءٖ وَهُدٗى
وَرَحۡمَةٗ وَبُشۡرَىٰ لِلۡمُسۡلِمِينَ ﴿٨٩﴾ ۞ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ
وَٱلۡإِحۡسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَيَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ
وَٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡبَغۡيِۚ يَعِظُكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ
﴿٩٠﴾ وَأَوۡفُواْ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ إِذَا عَٰهَدتُّمۡ وَلَا تَنقُضُواْ ٱلۡأَيۡمَٰنَ
بَعۡدَ تَوۡكِيدِهَا وَقَدۡ جَعَلۡتُمُ ٱللَّهَ عَلَيۡكُمۡ كَفِيلًاۚ إِنَّ
ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا تَفۡعَلُونَ ﴿٩١﴾ وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّتِي نَقَضَتۡ
غَزۡلَهَا مِنۢ بَعۡدِ قُوَّةٍ أَنكَٰثٗا تَتَّخِذُونَ أَيۡمَٰنَكُمۡ دَخَلَۢا
بَيۡنَكُمۡ أَن تَكُونَ أُمَّةٌ هِيَ أَرۡبَىٰ مِنۡ أُمَّةٍۚ إِنَّمَا يَبۡلُوكُمُ
ٱللَّهُ بِهِۦۚ وَلَيُبَيِّنَنَّ لَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ مَا كُنتُمۡ فِيهِ تَخۡتَلِفُونَ ﴿٩٢﴾
وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَلَٰكِن يُضِلُّ مَن
يَشَآءُ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُۚ وَلَتُسۡـَٔلُنَّ عَمَّا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٩٣﴾

الحزب ٢٨

٢٧٧

سزایشە بۆ خۆیان ﴿فألقوا إلیهم القول﴾ ئینجا خوا لەوكاتەدا پەرسراوەكان دێنێتە وەڵام و قسەكەیان ڕەت دەكەنەوەو دەڵێن: ﴿إنكم لكاذبون﴾ بەڕاستیی ئێوە درۆزنن ، چونكە ئێمە هاوبەش و شەریكی خوا نەبووین ، ئەم ئایەتەیش حاڵەتی دژایەتیی و دەمە دەمێی پەرسیارو پەرسراوەكان لە قیامەتدا باس دەكاو دەفەرموێ: (ومن اضل ممن یدعوا من دون الله من لایستجیب له إلی یوم القیامة وهم عن دعائهم غافلون، وإذا حشر الناس كانوا لهم أعداء وكانوا بعبادتهم كافرین) ﴿[87] والقوا إلی الله یومئذ السلم﴾ لەو ڕۆژەدا – ڕۆژی قیامەت – هەموو لەبەردەست خوای پەروەردگاردا مل ڕادەكێشن و هیچ دەسەڵاتێكیان نامێنێ ﴿وضل عنهم ما كانوا یفترون﴾ و ئەو درۆو دەلەسەیەش كە جاران هەڵیان دەبەست گوایە خواكانیان تكایان بۆ دەكەن– هەموو بزر دەبێ و، بەفیڕۆ دەچێ ﴿[88] الذین كفروا وصدوا عن سبیل الله﴾ ئەوانەی كە كافرو بێ باوەڕ بوون و خەڵكیشیان لەڕێی خوا دەگێڕایەوە ﴿زدناهم عذابا فوق العذاب بما كانوا یفسدون﴾ لەجەزای ئەو فەسادو ناپاكیەیاندا سزا لەسەر سزا جەزرەبەیان دەدەین " سزای بێ باوەڕبوونیان و، سزای ڕێگری كردنەكەیشیان لەخەڵك.

**هەموو پێغەمبەرێ دەبێتە شایەت لەسەر نەتەوەكەی خۆی :**

﴿[89] ویوم نبعث فی كل امة شهیدا علیهم من انفسهم﴾ ئەی پێغەمبەر! كافرانی هۆزەكەت وریا بكەرەوە لە ڕۆژێ كە لەنێو هەر ئوممەت و گەلێكدا شایەتێك (واتە: پەیامبەرێك) ڕاست دەكەینەوە تا گەواهییان لەسەر بدات ﴿وجئنا بك شهیدا علی هؤلاء﴾ و تۆیش بەشایەدی دێنین لەسەر ئەمانەی خۆت ، لەسوورەتی (نیساء)شدا هاتووەو دەفەرموێ: (فكیف إذا جئنا من كل أمة بشهید وجئنا بك علی هؤلاء شهیدا) ﴿ونزلنا علیك الكتاب تبیانا لكل شئ﴾ و ئەم قورئانەشمان بۆ ناردیت ئەی پێغەمبەر! ﷺ تاهەموو شتێك ڕوون بكاتەوە ﴿وهدی ورحمة وبشری للمسلمین﴾

و ببێتە ڕێنمایی و ڕەحمەت و مژدە بۆ موسڵمانان، واتە: ئەم قورئانە هەموو پێویستییەکی ئادەمزادی تێدایە، ئەر بەوردی پەیڕەوی بکەن، قەت تووشی هەڵەو پەڵە نابن.

**فەرمان بەعەدالەت :**

﴿[٩٠] إن الله يأمر بالعدل والإحسان﴾ بێگومان خوا فەرمان بەدادگەریی و چاکە کردن لەگەڵ تەواوی دروستکراوەکانیدا دەدا، تەنانەتی لەکاتی تۆڵە سەندنیشدا ، بۆیە لە کۆتایی ئەم سوورەتەدا دەفەرموێ: (وإن عاقبتم فعاقبوا بمثل ماعوقبتم ولئن صبرتم لهو خير للصابرين) ﴿وإيتاء ذي القربى﴾ و فەرمان بە صیلەی ڕەحم و بەخشش و پیاوەتیی و چاکە لەگەڵ خزم و نزیکانیشدا دەدا ، لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: (وآت ذالقربى حقه والمسكين وابن السبيل ولا تبذر تبذيرا) ﴿وينهى عن الفحشاء والمنكر والبغي﴾ وە لە هەموو کارێکی دزێوو خراپەو ستەم و لەسنوور دەرچوون ڕێ دەگرێ ، سەرەتا ئەم ئایەتە هەموو خێرو چاکەیەکی لەخۆ گرتووەو فەرمانیشی پێکردووە، هەروەکو بەشێکی تری ڕێ لەهەموو خراپەو خراپەکارییەك دەگرێ ﴿يعظكم لعلكم تذكرون﴾ خوا بەوشێوەیە ئامۆژگاریتان دەکات، تا بەشکو بیر بکەنەوەو پەند بگرن. (حاکیم) لە (عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود)ـەوە دەگێڕێتەوەو ئەڵێ: (هذه أجمع آية في القرآن لخير يمتثل، ولشر يجتنب) ، واتە: ئەم ئایەتە پتر لە ئایەتەکانی تر هەموخێرو بێرێکی لە ئامێز گرتووە، هەروەکو گشت خراپەیەکی لەخۆ گرتووە بۆ خۆلادان لێی.

**کە پەیمانتان بەست بەجێی بێنن :**

﴿[٩١] وأوفوا بعهد الله إذا عاهدتم﴾ و کاتێ پەیمانتان بەخوادا بۆکردنی هەر کارێك بەڕێك و پێکی جێبەجێی بکەن ﴿ولا تنقضوا الأيمان بعد توكيدها﴾ و سوێندو پەیمانەکانتان مەشکێنن‌و بەتاڵیان مەکەنەوە، پاش ئەوەی لێبڕان جێبەجێیان بکەن، واتە: ئەو سوێندو پەیمانەی لەگەڵ خەڵکێکدا گرێی دەدەن ، زۆر گرنگی بدەنێ و، بەکەم سەیری مەکەن و، بێ هۆی شەرعیی هەڵیمەوەشێننەوە ﴿وقد جعلتم الله عليكم كفيلا﴾ وە بەتایبەتی کە خواتان بەسەر خۆتانەوە کردووە بە(کەفیل) و دەسەبەر ﴿إن الله يعلم ما تفعلون﴾ بەڕاستیی خوا دەزانێ هەرکارێ ئێوە دەیکەن

﴿[٩٢] ولا تكونوا كالتي نقضت غزلها من بعد قوة انكاثا﴾ ئێوە وەکو ئەو ئافرەتە مەبن کەهەموو کات ڕێسەکەی خۆی دوای ڕێسان و بەهێزبوونیی، خاوەدەکردەوەو کوتکوت دەبوو، واتە: پەیماندان بە توندیی و، ئینجا هەڵوەشاندنەوەی بە ئاسانی، وەکوکاری ئەو ئافرەتە وایە کە ڕێسەکەی خۆی پاش ڕێسانی خاو بکاتەوەو بیکاتەوە بە خوری، جا ئێوە خاوەنی قسەو ئیمزاو پەیمانی خۆتان بن، بەتووڕە بوونێکی سادە پەیمان شکێنی مەکەن ﴿تتخذون ايمانكم دخلا بينكم﴾ سوێندو پەیمانەکانتان بەنیازی ئەوەوە بێت فڕو فێڵ لەیەك بکەن و، یەکتر بخەڵەتێنن ﴿ان تكون امة هي اربى من امة﴾ بەو بەهانەی فڵانە ئوممەت و گەل, لەگەلێکی تر زۆرترو بەهێزترە. لەو سەردەمەدا کە لەگەڵ لایەکدا پەیمانیان دەبەست، پاشان کە دەیاندی لایەکی تر بەهێز ترە، ئەویان هەڵدەوەشاندەوەو، دەهاتن لەگەڵ ئەم لایەنەکەی تردا پەیمانیان دەبەست! جا قورئانی پیرۆز هات کاری وای بەدزێوو ناپەسەند وەسف کرد ﴿إنما يبلوكم الله به﴾ دیارە خوا هەر دەیەوێ بەو پەیمانە تاقییتان بکاتەوە" بەراوردتان بکات ئاخۆ کێ پەیمان دەشکێنێ و، کێش نایشکێنێ ﴿وليبينن لكم يوم القيامة ما كنتم فيه تختلفون﴾ دڵنیاشبن ئەو شتانەی کەئێوە جیاوازیی و ئیختیلافتان تێیدا هەبوو خوا لەڕۆژی قیامەتدا بۆتان دەردەخا" هەق و ناهەقتان بۆ ڕۆشن دەکاتەوەو، هەموو کەسێکیش بەپێی ئەوە پاداش و تۆڵە وەردەگرێت.

**ئەرخوا ویستبای گشتتان هاو ئایین دەبوون :**

﴿[٩٣] **ولو شاء الله لجعلكم أمة واحدة**﴾ ئەگەر خوا ویستبای هەمووتانی دەكردە گەلێكی هاو ئایین، واتە: گشتتانی دەخستە سەر یەك شارێگە، ئیتر ئەو دەمە جیاوازیی و، پەراگەندەیی دروست نەدەبوو ﴿**ولكن يضل من يشاء ويهدى من يشاء**﴾ بەڵام دیارە حیكمەت و خواستی جۆرێكی ترە، مەیلی لە گومڕاكردنی هەركەسێك بێت ، ئەوا لاڕێ و گومڕای دەكات، حەزیشی لە ڕێنمایی هەر كەسێك بێت ، ئەوا شارەزاو ڕێنمای دەكات. لەئایەتێكی تردا جەخت لەسەر ئەوە دەكاتەوەو دەفەرموێ: (ولو شاء ربك لآمن من فى الأرض كلهم جميعا) یان دەفەرموێ: (ولو شاء ربك لجعل الناس أمة واحدة ولايزالون مختلفين إلا من رحم ربك ولذلك خلقهم) ﴿**ولتسألن عما كنتم تعملون**﴾ سوێندبێ لەوهەموو كارو كردەوەیە ئێوەكردتان دەپرسرێتەوە.

الجزء الرابع عشر — سورة النحل

وَلَا تَتَّخِذُوٓاْ أَيۡمَٰنَكُمۡ دَخَلَۢا بَيۡنَكُمۡ فَتَزِلَّ قَدَمُۢ بَعۡدَ ثُبُوتِهَا
وَتَذُوقُواْ ٱلسُّوٓءَ بِمَا صَدَدتُّمۡ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَكُمۡ عَذَابٌ
عَظِيمٞ ﴿٩٤﴾ وَلَا تَشۡتَرُواْ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ ثَمَنٗا قَلِيلًاۚ إِنَّمَا عِندَ ٱللَّهِ
هُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٩٥﴾ مَا عِندَكُمۡ يَنفَدُ
وَمَا عِندَ ٱللَّهِ بَاقٖۗ وَلَنَجۡزِيَنَّ ٱلَّذِينَ صَبَرُوٓاْ أَجۡرَهُم بِأَحۡسَنِ
مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٩٦﴾ مَنۡ عَمِلَ صَٰلِحٗا مِّن ذَكَرٍ
أَوۡ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَلَنُحۡيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةٗ طَيِّبَةٗۖ وَلَنَجۡزِيَنَّهُمۡ
أَجۡرَهُم بِأَحۡسَنِ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٩٧﴾ فَإِذَا قَرَأۡتَ ٱلۡقُرۡءَانَ
فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿٩٨﴾ إِنَّهُۥ لَيۡسَ لَهُۥ سُلۡطَٰنٌ
عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٩٩﴾ إِنَّمَا
سُلۡطَٰنُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَوَلَّوۡنَهُۥ وَٱلَّذِينَ هُم بِهِۦ مُشۡرِكُونَ
﴿١٠٠﴾ وَإِذَا بَدَّلۡنَآ ءَايَةٗ مَّكَانَ ءَايَةٖ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ
بِمَا يُنَزِّلُ قَالُوٓاْ إِنَّمَآ أَنتَ مُفۡتَرِۭۚ بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ
﴿١٠١﴾ قُلۡ نَزَّلَهُۥ رُوحُ ٱلۡقُدُسِ مِن رَّبِّكَ بِٱلۡحَقِّ لِيُثَبِّتَ
ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهُدٗى وَبُشۡرَىٰ لِلۡمُسۡلِمِينَ ﴿١٠٢﴾

٢٧٨ — ولقد نعلم

**سەرنجێك:** (قورتبی) دەڵێ: (اللام فی(ولیبینن).. (ولتسألن) مع النون المشددة یدلان علی قسم مضمر). واتە: ئەو پیتی (لام)انە كە لە كردارێكا هەن و، كۆتاییشی بە(نون)ی (تەوكید) دێت، بۆ سوێندە، وەكو (لیبیننّ) و.. هتد. ﴿[٩٤] **ولا تتخذوا ایمانكم دخلا بینكم**﴾ وە بە سوێندو پەیمانەكانتان دەغەڵی و فڕو فێڵ و گزیی لەگەڵ یەكتر مەكەن، واتە: وادەبێ سوێند بۆ یەكتر دەخۆن و پەیمان بەیەكتر دەدەن، كەچی دڵتان شتێكی تری تێدایە ﴿**فتزل قدم بعد ثبوتها**﴾ نەكا بەوكارە (پێ)بخلیسكێ و (لەسەر ڕێبازی باوەڕ) بترازێت ، پاش دامەزراندن و تابتبوونی لەسەر ئەو ڕێبازە ، واتە: بەكار هێنانی سوێندو پەیمان بەنیازی دەخەڵی و فرت و فێڵەوە، مرۆڤ لەڕێی ڕاست دەترازێنێ ﴿**وتذوقوا السوء بما صددتم عن سبیل الله**﴾ وە نەوەك بەهۆی ڕێگریتانەوە لەڕێگەی خوا سزای سەخت بچێژن ﴿**ولكم عذاب عظیم**﴾ وە لە دواڕۆژیشدا سزایەكی گەورەتان بۆ هەیە ﴿[٩٥] **ولا تشتروا بعهد الله ثمنا قلیلا**﴾ و بەڵێن و پەیمانێ بەخواتان داوەو، بەیعەتێ بەپەیامبەرتان داوە، بەنرخ و بەهایەكی كەم مەفرۆشن و مەگۆڕنەوە ﴿**إنما عند الله هو خیر لكم**﴾ بێگومانبن هەرئەو خێرو پاداشەی لای خوا ئامادەكراوە, لە هەموو شتێ بۆ ئێوە چاكترە ﴿**إن كنتم تعلمون**﴾ ئەگەر بزانن ﴿[٩٦] **ما عندكم ینفد**﴾ هەرچی لای ئێوەیە تیا دەچێ و نابووت دەبێت ﴿**وما عند الله باق**﴾ وەئەو خێرو پاداشەلای خوایە، هەردەمێنێتەوەو كۆتایی نایەت ﴿**ولنجزین الذین صبروا اجرهم بأحسن ماكانوا یعملون**﴾ وەئەمەش سوێندی بێت ئەوانەی وا لەبەرامبەر فەرمانەكانی خواوە بەئارامبوون و نەپسان ، ئێمە بەچاكتر لەوەی كردوویانە پاداشیان دەدەینەوە.

**کرداری باشەو پاداشتەکەی :**

﴿[٩٧] من عمل صالحا من ذكر او انثى وهو مؤمن﴾ هەرکەسێك - لە نێر یان لە مێ - هەر کارێکی چاك ئەنجامبداو، بەئیمان و باوەڕداریش بێت ﴿فلنحيينه حياة طيبة﴾ بەڵێن بێت بیژێنین بە ژیانێکی پاك، واتە: بە ژیانێکی بەقەناعەت و بەسەعادەت, لەم فەرموودەیەشدا - کەپێشەوا ئەحمەد لە عەبدوڵڵای کوری عەمر ریوایەتی کردووە- بۆ دووپاتی ئەوە هاتووەو دەفەرموێ: ((قد أفلح من أسلم، و رُزق كفافا، وقنعه الله بما آتاه)) وە ئیمامی موسلیمیش ریوایەتی کردووە / مسلم. ٢ / ٧٣٠ . واتە: ئەوی موسڵمان بوو و رزق و رۆزی خود کەفافی درایەو, خواش بەوەی پێیداوە قەناعەتی پێکرد, بێ شك ئەو کەسە بردوویەتیەوە.﴿ولنجزينهم اجرهم بأحسن ماكانوا يعملون﴾ و بەچاکتریش لەوەی کردوویانە پاداشیان بدەینەوە.

**بەر لەقورئان خوێندن ( أعوذ بالله.. )ی بکەن :**

﴿[٩٨] فإذا قرات القرآن﴾ جا هەرکە ویستت قورئان بخوێنی ﴿فاستعذ بالله من الشيطان الرجيم﴾ بەرلەوە (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم) بکەو هەر بەخوا پەنا بەرە لەپیلان و وەسوەسەی شەیتانی دوورەوە خراو، هەتا نەتوانێ لە وردبوونەوە لەماناو مەبەستی قورئان رێت لێبگرێت، **بۆیە جەماوەری زاناکان دەڵێن** : بەر لە دەست کردن بە قورئان خوێندن سوننەتە (أعوذ بالله..) بکرێ ﴿[٩٩] إنه ليس له سلطان على الذين آمنوا﴾ چونکە بێگومانە کە (شەیتان) هیچ زۆرو دەسەڵاتێکی بەسەر ئەوانەدا نیە کە بڕوایان هێناوە ﴿وعلى ربهم يتوكلون﴾ تەنها بەپەروەردگاریشیان پشت دەبەستن ﴿[١٠٠] إنما سلطانه على الذين يتولونه﴾ بەڕاستی هەر تەنها بەسەر ئەوانەدا دەستەڵاتی هەیە کە ئەو دەکەنە پشتیوان و دۆستی خۆیان و گوێڕایەڵی دەبن ﴿والذين هم به مشركون﴾ وە هەروەها بەسەر ئەوانەیشدا کە هاوبەش بۆ خوا دادەنێن، هەمیشە ئەوانە مجرۆ دەکاو تەوبەشیان بە بیردا نایەت ﴿[١٠١] وإذا بدلنا آية مكان آية﴾ هەر کات ئێمە ئایەتێك بە ئایەتێکی تر بگۆڕین و لابەرین، وەیان ئایەتێکی تر لەجێی ئەودا بنێین ﴿والله اعلم بما ينزل﴾ و خوا بۆ خۆی زاناترە بەوەی دایدەبەزێنێ, واتە: ئەوچاك دەزانێت چ شتێ چاکە بۆ ئێستاو بۆ ئاییندەو کامەش هەڵگرێ و بیسڕێتەوە ﴿قالوا إنما انت مفتر﴾ کەچی ئەوەندە کەودەن و نەفامن لەوەڵامدا دەیانوت: ئەی موحەممەد! تۆهەر درۆ هەڵدەبەسیت, بۆیە بەو شێوەیەو بەئارەزووی خۆت هەر رۆژەی ئاڵ و گۆڕێ دەکەیت، ئەمرۆ شتێك دەڵەیت و، سبەینێ شتێکی دیکە ﴿بل اكثرهم لا يعلمون﴾ نا، تۆ درۆ هەڵبەس نیت، بەڵکو ئەوانە زۆربەیان بۆخۆیان نەزانن و، لەحیکمەتی خوا تێناگەن، بۆیە وا رەخنەی بێجێ دەگرن و تەسلیم نابن ﴿[١٠٢] قل نزله روح القدس من ربك بالحق﴾ تۆ لە وەڵامیاندا بڵێ: (روح القدس)ی (جوبریل)ـە کە لەلای پەروەردگارتەوە بەحەق ودادگەرانە دایبەزاندووە ﴿ليثبت الذين آمنوا﴾ تا ئەوانەی بڕوایان هێناوە دامەزراوو دڵنیا بکا ﴿وهدى وبشرى للمسلمين﴾ وەهیدایەت و رێنمایی و، مژدە بێ بۆموسڵمانان.

**دەڵێن بنیادەمێ قورئانی فێرکرد! :**

﴿[١٠٣] ولقد نعلم انهم يقولون﴾ سوێندبێ ئەمەش چاك دەزانین کەئەوانە پێت دەڵێن: ﴿إنما يعلمه بشر﴾ هەر ئادەمیە کەئەم قورئانەی فێر دەکات، مەبەستیان لە کابرایەکی رۆمی بوو ! ﴿ولسان الذى يلحدون إليه اعجمى﴾ خۆ زمانی ئەوکەسەی ئەوان نیازیانە ئەم قورئانە بدەنە پاڵی ئەو، عەجەمییەو لەعارەبیش نەزان و کۆڵە ﴿وهذا لسان عربى مبين﴾ ئەم قورئانەش بەزمانێکی عەرەبیی خۆشخوان و رەوانبێژی ئاشکرایە، باشە! ئەر کەسێك عەرەبی چاك نەزانێ چۆن دەتوانێ شتی وا بەو هەموو رەوانبێژی و بەلاغەتەوە بڵێ ! ﴿[١٠٤] إن الذين لا يؤمنون بآيات الله لا يهديهم

الله﴾ بەڕاستیی ئەوانەی وا بۆخۆیان ئامادەنین بڕوا بهێنن بە قورئان و بەئایەتەکانی خوا، خوایش هەرگیز شارەزاو ڕێنماییان ناکات بۆلای خۆی ﴿ولهم عذاب اليم﴾ و سزایەکی بەئێشیشیان بۆ هەیە ﴿إنما يفترى الكذب الذين لا يؤمنون بآيات الله﴾ بەراستیی هەر ئەوانە درۆ هەڵدەبەسن کە بڕوایان بەئایەتەکانی خوا نییە ﴿اولئك هم الكاذبون﴾ لەڕاستییدا تەنها ئەوانە درۆزنن، ئیتر چۆن بەتۆ دەڵێن ئەی موحەممەد! درۆزنیی و درۆ بۆخوا هەڵدەبەسیت ؟!

**توڕەیی خوا لە مورتەد، بەدەر لەناچاری :**

١٠٦ ﴿من كفر بالله من بعد إيمانه﴾ هەرکەسێك پاش بڕوا هێنانی بەخوا، کافرو بێ باوەڕ بێتەوە، بێگومان سزای توند دەدرێ و، دەکەوێتە بەر قارو تووڕەیی خواوە ﴿إلا من اكره وقلبه مطمئن بالإيمان﴾ مەگەر کەسێك زۆری لێ کرابێ و، لەوکاتەیشدا دڵنیابێ بەئیمان، وەکو (عەمماری کوڕی یاسر) خوا لێیان خۆش بێت. (ئیبن عەباس) دەڵێت: موشریکەکان ئازارو ئەشکەنجەی (عەممار)یان زۆردا، بەرادەیەك گەیشتە حاڵەتێك لەژێر سزادا تیا بچێت، ئەوسا لەبەرناچاریی و بەدڵێکی پڕ لە ئیمانەوە ئەوانی ڕازیی کرد، جا بۆ دوایی هاتە لای پێغەمبەری خواو کارەساتەکەی بۆ گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: لەو کاتەدا دڵت چۆن بوو؟ (عەممار) گوتی: دڵنیا بووم بەئیمان: فەرمووی: دەسا ئەگەر ئەم جارەش ئەو حاڵەتە دووبارە بوویەوە، تۆیش جاران چیت گوتبوو بیڵێرەوە. (قورتبیی) دەڵێت: (اجمع العلماء على أن من أكره على الكفر فاختار القتل انه أعظم أجرا عند الله، ممن أختار الرخصة. واختلفوا فيمن اكره على غير القتل من فعل ما لايحل له، فقال أصحاب مالك: الأخذ بالشدة في ذلك واختيار القتل والضرب افضل عند الله من الأخذ بالرخصة. وأجمعوا أيضا على أن من أكره على قتل غيره انه لا يجوز له الإقدام على قتله ولا إنتهاك حرمته.. ويصبر على البلاء الذي نزل به. وإذا استكرهت المرأة على الزنى فلا حد عليها، لقوله تعالى: (إلا من أكره).واتە: زاناکان یەکدەنگن کە: هەرکەسێك زۆری لێبکرێ بۆ کوفرو بێ باوەڕیی، ئەگینە دەیکوژن، پاشان ئەویش کوشتنەکەی هەڵبژاردو وشەی کوفر بەزارییدا نەهات و کوشتییان، بێگومانە کەپاداشی ئەم کەسە زۆر مەزنترە لەوکەسە کەمۆڵەتەکە بۆخۆی هەڵبژێری و بەزمان خۆی کافر دەکاو قوتار دەبێت، بەڵام ئەگەر زۆر کردنەکە بۆکردنی کارێکی تری حەرام بوو، غەیری (قەتل)، بۆ ئەمە پێشەوا (مالیك) دەڵێ: هەڵبژاردنی توندوو تیژیەکەو خۆبەکوشتدانەکە باشترە. زاناکان بۆ ئەمە یەکدەنگن کە: هەرکەسێ زۆری لێبکرێ بۆ کوشتنی کابرایەك ئەگەرنا خۆی دەکوژرێ، بۆی نییە کاری وابکات، وەهەروەها کاتێ ئافرەتێك بە زۆر زینای لەگەڵ کرا (حەددی) لەسەر نابێت. ﴿ولكن من شرح بالكفر صدرا﴾ بەڵام کەسێك بەپێخۆشبوونی خۆی سینگی بۆ کوفر



وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُۥ بَشَرٌۗ لِّسَانُ
ٱلَّذِى يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِىٌّ وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِىٌّ
مُّبِينٌ ﴿١٠٣﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ لَا يَهْدِيهِمُ
ٱللَّهُ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٠٤﴾ إِنَّمَا يَفْتَرِى ٱلْكَذِبَ ٱلَّذِينَ
لَا يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰذِبُونَ
﴿١٠٥﴾ مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ إِيمَٰنِهِۦٓ إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ
وَقَلْبُهُۥ مُطْمَئِنٌّۢ بِٱلْإِيمَٰنِ وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ بِٱلْكُفْرِ صَدْرًا
فَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٠٦﴾
ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا عَلَى ٱلْـَٔاخِرَةِ
وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٠٧﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ
ٱلَّذِينَ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ وَسَمْعِهِمْ وَأَبْصَٰرِهِمْۖ
وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْغَٰفِلُونَ ﴿١٠٨﴾ لَا جَرَمَ أَنَّهُمْ فِى
ٱلْـَٔاخِرَةِ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿١٠٩﴾ ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ
لِلَّذِينَ هَاجَرُوا۟ مِنۢ بَعْدِ مَا فُتِنُوا۟ ثُمَّ جَٰهَدُوا۟
وَصَبَرُوٓا۟ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعْدِهَا لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٠﴾

فراوان و گوشاد بکاو کوفرەکەشی پێخۆش بێت ﴿فعليهم غضب من الله﴾ ئەوە قارو تورەیی خوایان لەسەردەبێ
﴿ولهم عذاب عظيم﴾ وسزایەکی گەورەشیان لە دواڕۆژدا بۆ هەیە ﴿١٠٧ ذلك بأنهم استحبوا الحياة الدنيا على
الآخرة﴾ چونکە ئەوان ژیان و گوزەرانی ئەم دونیایەیان هەڵبژارد بەسەر پاشەڕۆژدا، وەهەڵبژاردنی دنیا بەسەر دوا
ڕۆژدا کافربوونە ﴿وان الله لايهدى القوم الكافرين﴾ بێگومان خواش خەڵکانی بێ باوەڕو کافر شارەزاو ڕێنوێن
ناکات بۆسەر ڕێی ڕاست ﴿١٠٨ اولئك الذين طبع الله على قلوبهم وسمعهم وابصارهم﴾ ئەمانە ئەو کەسانەن کە خوا
مۆری بەدبەختیی بەسەر دڵ و گوێ و چاویاندا ناوە، ئیتر هەق و ناهەق لەیەك جیا ناکەنەوە ﴿واولئك هم الغافلون﴾
وە ئەوانە خافڵ و بێ ئاگایشن، گوێ بەهیچ شتێك نادەن ﴿١٠٩ لا جرم انهم فى الآخرة هم الخاسرون﴾ بێگومان لە
پاشەڕۆژیشدا زیانمەندو دۆڕاو ئەوانن ﴿١١٠ ثم إن ربك للذين
هاجروا من بعد ما فتنوا﴾ جا بەراستی پەروەردگارت
سەبارەت بەوانەی کەوا دوای ئەوگشت ئازارو ئەشکەنجە
لەمەککەوە کۆچیان کردو بۆمەدینە ﴿ثم جاهدوا وصبروا﴾
پاشان دەستیان دایە جیهادو، لەسەر پێشهاتەکانی جیهاد
بەئارام بوون ﴿إن ربك من بعدها لغفور رحيم﴾ بەڕاستیی
پەروەردگارت- پاش ئەنجامدانی ئەو کارانە- زۆر لێبوردەیە
بەرامبەریان، زۆریش میهرەبانە ﴿١١١ يوم تأتى كل نفس
تجادل عن نفسها﴾ ڕۆژێ دێ کە هەرکەس لەبیری خۆیدایەو
دەمەقاڵێ و بەرگری لە خۆی دەکات، بۆ ڕزگارکردنی خۆی،
واتە: لەبەر سەختیی ئەوڕۆژەیە کەسی لەبیر نامێنێ و،
بەدەر لە خۆیشی کەسێك نیە پشتیوانی لێ بکات ﴿وتوفى
كل نفس ما عملت﴾ هەموو کەسێکیش چی کردبێت بەڕێك و
پێکی پاداش و تۆڵەکەی پێدەدرێتەوە ﴿وهم لا يظلمون﴾ و
هیچ ستەمێکیشیان لێ ناکرێ.



۞ يَوْمَ تَأْتِي كُلُّ نَفْسٍ تُجَادِلُ عَن نَّفْسِهَا وَتُوَفَّىٰ كُلُّ
نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿١١١﴾ وَضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا
قَرْيَةً كَانَتْ آمِنَةً مُّطْمَئِنَّةً يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَدًا
مِّن كُلِّ مَكَانٍ فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ اللَّهِ فَأَذَاقَهَا اللَّهُ لِبَاسَ
الْجُوعِ وَالْخَوْفِ بِمَا كَانُوا يَصْنَعُونَ ﴿١١٢﴾ وَلَقَدْ
جَاءَهُمْ رَسُولٌ مِّنْهُمْ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَهُمُ الْعَذَابُ وَهُمْ
ظَالِمُونَ ﴿١١٣﴾ فَكُلُوا مِمَّا رَزَقَكُمُ اللَّهُ حَلَالًا طَيِّبًا
وَاشْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴿١١٤﴾
إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةَ وَالدَّمَ وَلَحْمَ الْخِنزِيرِ وَمَا
أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ ۖ فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَإِنَّ
اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٥﴾ وَلَا تَقُولُوا لِمَا تَصِفُ أَلْسِنَتُكُمُ
الْكَذِبَ هَٰذَا حَلَالٌ وَهَٰذَا حَرَامٌ لِّتَفْتَرُوا عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ ۚ
إِنَّ الَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ لَا يُفْلِحُونَ ﴿١١٦﴾ مَتَاعٌ قَلِيلٌ
وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١١٧﴾ وَعَلَى الَّذِينَ هَادُوا حَرَّمْنَا مَا قَصَصْنَا عَلَيْكَ
مِن قَبْلُ ۖ وَمَا ظَلَمْنَاهُمْ وَلَٰكِن كَانُوا أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿١١٨﴾



### نەزیلەی شاری مەککە :

﴿١١٢ وضرب الله مثلا قرية﴾ خوا مەسەل و نموونەی
خۆشگوزەرانی و ئاوەدانیی شاری (مەککە) دێنێتەوە ﴿كانت آمنة مطمئنة﴾ کە ژیانیان پڕ بوو لە ئاسوودەیی و
ئارامش, کەچی لەملاو لەولای ئەوانیشەوە خەڵك تاڵاندەکراو دەرفێنران , پاشان کە پەیامبەریان ﷺ بۆ هات و,
لەباتی شوکرانە بژێریی، پشتیان تێکردو دڵیان ئێشان، ئینجا خوای باڵادەست جۆراو جۆر جەزرەبەی دان و لێی
تێکدان ﴿يأتيها رزقها رغدا من كل مكان﴾ لەهەموولایەکەوە ڕزق و ڕۆزیی و نیعمەتی زۆریان بۆ دەهات ﴿فكفرت
بأنعم الله﴾ کەچی لەباتی شوکرانە بژێریی لەبەرامبەر ئەو هەموو گشت چاکەوە ناسوپاسی نیعمەتەکانی
خوایانکردو، باوەڕیان بەپێغەمبەرەکەی نەکردو چوون بەگژیا ﴿فأذاقها الله لباس الجوع والخوف بما كانوا
يصنعون﴾ جا خوایش جل و بەرگی برسیەتی و ترسی لەبەرکردن و تاڵاوی پێچەژین، پاش ئەوە کە پێغەمبەر ﷺ
دوعای لێکردن و فەرمووی: خودایە ! داوات لێدەکەم: ساڵە قات و قڕەکانی سەردەمی (یوسف)یان بەسەر بێنە،

ئینجا گرانیەکی وایان تێکەوت، بەناچاریی کورکی وشتریان تێکەڵی خوێن دەکردو لەسەر ئاگریان دەناو دەیانخوارد ! ﴿١١٣ ولقد جاءهم رسول منهم فكذبوه﴾ بێگومان هەر لەخۆیان پەیامبەرێك وەکو موحەممەد ﷺ هاتەلایان، کەچی بڕوایان پێ نەکردو بەدرۆیان خستەوەو ڕووبەڕوی وەستان ﴿فأخذهم العذاب وهم ظالمون﴾ ئینجا هێندە ستەمکاربوون سزا گشتیانی گرتەوە.

**حەڵاڵ بخۆن و شوکر بکەن :**

﴿١١٤ فكلوا مما رزقكم الله حلالا طيبا﴾ دەسائێوە ئەی باوەڕداران ! لەو رزق و نیعمەتە حەڵاڵ و پاکەیە بخۆن، خوا پێی بەخشیوون ﴿واشكروا نعمة الله إن كنتم إياه تعبدون﴾ و شوکرو سوپاسی نیعمەتی خوا بکەن، ئەگەر ڕاستە ئێوە هەر ئەو دەپەرستن ﴿١١٥ إنما حرم الله عليكم الميتة والدم ولحم الخنزير وما أهل لغير الله به﴾ بەڕاستیی خوا هەر گۆشتی مردار بوو و خوێنی ڕەوان و گۆشتی بەرازو ئەو سەربڕاوەی کە بەناوی غەیری خواوە سەر دەبڕێت لێی حەرامکردوون ﴿فمن اضطر غير باغ ولا عاد فإن الله غفور رحيم﴾ جاهەرکەسێك ناچار بوو بۆ خواردنی ئەمانە، دەبا – بێ زیادەڕەویی ولەئەندازە بەدەر – لێیان بخوا, چونکە بێگومان خوا زۆر لێبوردە، زۆریش میهرەبانە، ئەوەتە لەکاتی گرانیی و نەبوونییدا ڕێگەی داوە بەخواردنی ئەو شتە حەرامانە بێ زیادە ڕەویی. ﴿١١٦ ولا تقولوا لما تصف ألسنتكم الكذب هذا حلال وهذا حرام﴾ وە بەزمان و سەر زارەکیی و، بێ بەڵگەی شەرعیی، لەخۆتانەوە هەندێ شت حەڵاڵ، یان حەرام مەکەن، مەڵێن: ئەمە حەڵاڵەو ئەوەحەرامە، ئێوە وەکو ئەو موشریکانە مەکەن کە بەئارەزووی خۆیان (بەحیرە)و (سایبە)و (وەصیلە)و (حام)یان لە خۆ حەرامکرد! ﴿لتفتروا على الله الكذب﴾ هەر بۆ ئەوە لەسەر خوا درۆهەڵبەسن !، چونکە حەڵاڵ و حەرام بەدەستیی ئێوە نیەو، بۆتان نیە سنوور شکێنی بکەن ﴿إن الذين يفترون على الله الكذب لا يفلحون﴾ بێگومان ئەوانەی کەدرۆ بۆ خواو ئاینی خوا هەڵدەبەستن، سەرفرازو ڕزگارو بەختەوەر نابن ﴿١١٧ متاع قليل﴾ لەم ژیانی دنیادا کەمێك بۆخۆ ڕادەبوێرن و بەهرەیەکی کەمیان بۆ دەبێ ﴿ولهم عذاب أليم﴾ و لە قیامەتیشدا سزایەکی بەژان و ئێش پێکەیەنەریان هەیە، لەجێگایەکی تردا دەفەرموێ: (نمتعهم قليلا ثم نضطرهم إلى عذاب غليظ) ﴿١١٨ وعلى الذين هادوا حرمنا ما قصصنا عليك من قبل﴾ بۆ ئەوانەش جوولەکەن چەند شتێکمان حەرامکرد کەلەوەو پێش لەسوورەتی (ئەنعام)دا بەم ئایەتە بۆمان گێڕایەتەوە کەدەفەرموێ: (وعلى الذين هادوا حرمنا كل ذي ظفر ومن البقر والغنم حرمنا عليهم شحومهما إلا ما حملت ظهورهما..)١٤٦/٦. ﴿وما ظلمناهم ولكن كانوا أنفسهم يظلمون﴾ ئێمە بەو حەرامکردنە ستەممان لێ نەکردن ، بەڵام ئەوان ستەمیان لەخۆیان کرد بەهۆی لادان وسنوور بەزاندنەوە، ،وەکو لە جێیەکی تردا دەفەرموێ: (فبظلم من الذين هادوا حرمنا عليهم طيبات أحلت لهم..)﴿١١٩ ثم إن ربك للذين عملوا السوء بجهالة﴾ ئەوسا بێگومان سەبارەت بەوانەش وا بەنەفامیی و نەزانی کاری خراپ و ناجۆریان کرد ﴿ثم تابوا من بعد ذلك وأصلحوا﴾ لەپاشان دوای ئەو کارە ناهەموارەیان پەشیمان بوونەوەو، خۆیان چاکسازی کرد ﴿إن ربك من بعدها لغفور رحيم﴾ دڵنیابە کە پەروەردگارت پاش ئەوە زۆر لێبوردەیە بەرامبەریان، زۆریش میهرەبان و دلۆڤانە.

**ئیبراهیم رابەرێکی هەقڕەو بوو :**

﴿١٢٠ إن إبراهيم كان أمة قانتا لله﴾ بەڕاستیی (ئیبراهیم)ی پەیامبەر ﷺ هۆگری هەموو کارێکی خێرو ملکەچی فەرمانەکانی خوابوو ﴿حنيفا﴾ لەهەموو ئاینێکی پڕوو پووچ لای داو بەرەو بەرنامەی پاك و ڕاستی خوا هات ﴿ولم يك من المشركين﴾ و هەرگیز لەهاوبەشدانەرانیش نەبووە ﴿١٢١ شاكرا لأنعمه﴾ سوپاسگوزاری بەخششەکانی

خوا بوو ﴿اجتباه وهداه إلى صراط مستقيم﴾ خواش بۆ خۆی هەڵیبژارد بۆ پەیامبەرێتی و ڕێنموونیشی کرد بۆ ڕێگەی ڕاست و یەکخواپەرستیی، لەسوورەتی (ئەنبیا)شدا دەفەرموێ: (ولقدآتينا إبراهيم رشده من قبل وكنا به عالمين) ﴿[١٢٢] وآتيناه في الدنيا حسنة﴾ ئێمەیش هەر لەدونیادا ناوو شۆرەتی باشمان دایە ﴿وإنه في الآخرة لمن الصالحين﴾ و لەپاشەڕۆژیشدا بێگومان لەڕیزی صاڵحان و چاکاندایە ﴿[١٢٣] ثم أوحينا إليك أن اتبع ملة إبراهيم حنيفا﴾ لە پاشا وەحیی و سروشمان بۆ تۆ کرد ئەی پێغەمبەر ! ﷺ کە دەبێ پەیڕەوی لەئایینی پاك و ڕاستی ئیبراهیم بکەیت بە ڕێك وراستی﴿وماكان من المشركين﴾ و هەرگیز لەهاوبەشدانەران نەبووە، وەکو لە سوورەتی(ئەنعام)دا هاتووەو دەفەرموێ: (قل إنني هداني ربي إلى صراط مستقيم دينا قيما ملة إبراهيم حنيفا وماكان من المشركين).

الجزء الرابع عشر　　سورة النحل

ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ عَمِلُوا۟ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٍ ثُمَّ تَابُوا۟ مِنۢ
بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوٓا۟ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعْدِهَا لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٩﴾
إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا لِّلَّهِ حَنِيفًا وَلَمْ يَكُ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ
﴿١٢٠﴾ شَاكِرًا لِّأَنْعُمِهِ ٱجْتَبَىٰهُ وَهَدَىٰهُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ
﴿١٢١﴾ وَءَاتَيْنَٰهُ فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَإِنَّهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ
﴿١٢٢﴾ ثُمَّ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ أَنِ ٱتَّبِعْ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا وَمَا كَانَ
مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٢٣﴾ إِنَّمَا جُعِلَ ٱلسَّبْتُ عَلَى ٱلَّذِينَ
ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ وَإِنَّ رَبَّكَ لَيَحْكُمُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا
كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿١٢٤﴾ ٱدْعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلْحِكْمَةِ
وَٱلْمَوْعِظَةِ ٱلْحَسَنَةِ وَجَٰدِلْهُم بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ إِنَّ رَبَّكَ
هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ ﴿١٢٥﴾
وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا۟ بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُم بِهِۦ وَلَئِن صَبَرْتُمْ
لَهُوَ خَيْرٌ لِّلصَّٰبِرِينَ ﴿١٢٦﴾ وَٱصْبِرْ وَمَا صَبْرُكَ إِلَّا بِٱللَّهِ
وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ وَلَا تَكُ فِى ضَيْقٍ مِّمَّا يَمْكُرُونَ
﴿١٢٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا۟ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ ﴿١٢٨﴾

٢٨١

**ڕێزنان لە شەممە بۆ جوولەکانە :**

﴿[١٢٤] إنما جعل السبت على الذين اختلفوا فيه﴾

ڕێزگرتن لە ڕۆژی (شەممە)و ئیش و کارنەکردن تێیدا لەئایینی (ئیبراهیم)دا نەبووە، بەڵکو هەر بۆ ئەوانە بڕیار دراو کرایە ڕۆژی خواپەرستیی کە ئیختلاف و ناکۆکییان بوو لەدیاری کردنی ئەو ڕۆژەدا ، لە سەرەتاوە خوا ڕۆژی هەینیی بۆ دیاریکردن ، کەچی گواستیانەوە بۆ ڕۆژی شەممە، ئینجا خوایش لەسەری گرانکردن کە: نابێ لەو ڕۆژەدا هیچ جمو جوڵو کارێك بکەن ، کەچی لەویشدا هەر کەوتنەوە فڕت و فێڵ ﴿وإن ربك ليحكم بينهم يوم القيامة فيما كانوا فيه يختلفون﴾ بێگومان پەروەردگاری تۆ ڕۆژی قیامەت سەبارەت بەوەی ئەوان ناکۆکییان تێیدا هەبوو بەدادگەرانە داوەرییان دەکاو، هەریەکەشیان بەپێی کاروکردەوەی خۆی تۆڵەو پاداشی دەدا.

**بەژیرانە نامەکەی خوا بگەیەنە :**

﴿[١٢٥] أدع إلى سبيل ربك بالحكمة والموعظة الحسنة﴾

ئەی پێغەمبەر! ﷺ، ئەی ئیماندار! هەر بەژیرانەو نەرم و قسەی خۆش و حیکمەت و، ئامۆژگاری شیرین و جوان، خەڵك بۆ ڕێگای پەروەردگارت بانگ بکە، سروشتی ئادەمزاد وایە خۆی بەشت دەزانێ و بەئاسانی تەسلیم نابێت، جا لەبەر ئەوە دەبێ زۆر بە ژیرانە بۆی بچیتە پێش، نەوەکو دەعیەو خۆ بەزلزانین زاڵببێت بەسەریاو، گوێ نەگرێ بۆت ﴿وجادلهم بالتي هي أحسن﴾ وە بەچاکترو باشترین شێوە قسەو گفت وگۆیان لەگەڵ بکە، بەڵگەی جوان و بەهێزیان بۆ بهێنەوە، هەتا وەزع ئاساییە ، خۆ ئەگەر قۆناغی جەنگ و پێکدادانبوو ، دیارە تۆیش بەیاسای جەنگ کار دەکەیت لەگەڵیاندا، هەتا دینەکەت ڕیسوا نەبێت ، چونکە مەردم دینی سووك و ڕیسوا وەرناگرێت! ﴿إن ربك هو أعلم بمن ضل عن سبيله﴾ تۆ ئاوا موجادەلەیان لەگەڵ بکە ، بەڕاستی پەروەردگاریشت باشتر بەحاڵی ئەوە دەزانێت کە لەڕێی ئەو لایداوە ﴿وهو أعلم بالمهتدين﴾ و زاناتریشە بەحاڵی ئەو کەسانە ڕێنوێنن و لەسەر ڕێی ڕاستن.

قورتبیی دەڵێت: (هذه الآية: نزلت بمكة في وقت الأمر بمهادنة قريش ، وأمره أن يدعو الى دين الله وشرعه بتلطف ولين دون مخاشنة وتعنيف، وهكذا ينبغي أن يوعظ المسلمون الى يوم القيامة. فهي محكمة في جهة العصاة من الموحدين، ومنسوخة بالقتال من جهة الكفار).

**دەبێ تۆڵە بەرامبەر بێت :**

﴿[١٢٦] وإن عاقبتم فعاقبوا بمثل ما عوقبتم به﴾ وەئەگەر تۆڵەتان کردەوە ، بادار بە داربێ‌و، سەرەڕۆیی وزیادە ڕەوی تێدا نەبێ. ڕاڤەکەرانی قورئان دەڵێن: ئەم ئایەتە (مەدەنی)یەو سەبارەت بە (حەمزە)ی (سيد الشهداء) هاتۆتە خوارەوە، ئەوکاتە کە لە (ئوحود) پاش شەهیدبوونی موشریکەکان لاشەکەیان تێکداو سکیان دڕیی، ئەوجا پەیامبەریش ﷺ زۆر دڵگران و بێ تاقەت بوو، بۆیە فەرمووی: سوێند بەخوابێ: ئەگەر ئەمجارە خوای گەورە زاڵم بکا بەسەریانا، ئەوەی بە (حەمزە) کراوە، بەحەفتا کەسیانی دەکەم. ﴿ولئن صبرتم﴾ دڵنیاشبن ئەگەر ئێوە خۆ ڕابگرن و تۆڵە نەکەنەوە، ئەگەرچی هەقیشتان بێت تۆڵە بکەنەوە ﴿لهو خير للصابرين﴾ دیارە کاری وا بۆ خۆ ڕاگران و ئارامگران باشترە تا تۆڵە وەرگرتنەوە، بەمەرجێ بتوانن شەڕو خراپە لەخۆتان دوور بخەنەوەو، بیشزانن دەبێتە سەرکەوتن بۆتان ﴿[١٢٧] واصبر وما صبرك إلا بالله﴾ ئینجا بەڕاشکاویی داوای ئارامگرتن دەکات، بۆیە دەفەرموێ: خۆ ڕاگربەو ئارامت هەبێ لەتۆڵە وەرگرتنەوەدا، کە دیارە بەئارام بوونیشت، هەر بەکۆمەك و فەرمانی خوا دەبێت، هەر ئەو دەتوانێ یارمەتیت بدا بۆ خۆڕاگرتن، ئەگینە کێ دەتوانێ نەفسی ڕام دایمرکێنێت؟ ﴿ولا تحزن عليهم﴾ وە لەبەر ئەوانەش کە بڕوا ناهێنن خەم و خەفەت مەخۆ ﴿ولا تك في ضيق مما يمكرون﴾ و لە فڕوفێڵیان دڵتەنگو سەخڵەت مەبە، چونکە تۆ تەنها ڕاگەیاندنت لەسەرە، ئیتر باوەڕ بهێنن یانا، تۆ بەرپرس نابیت ﴿[١٢٨] إن الله مع الذين اتقوا﴾ بەڕاستیی خواش لەگەڵ ئەوانەدایە کەخۆ پارێزو بەتەقوان ﴿والذين هم محسنون﴾ و ئەوانەش چاکەکارو، چاکەخوازن، ئەم لەگەڵ بوونەش تەنها خوا خۆی باش دەزانێت چۆن دەبێت. لەسوورەتی (ئەنفال) یشدا دەفەرموێ: (إذ يوحي ربك إلى الملائكة أني معكم فثبتوا الذين آمنوا..).

سوپاس بۆ خوای تاك و تەنیا، بێ حیساب و ئەژمار، شوکرانە بژێرم کە: پشتیوانی لێکردم بۆ تەواوکردنی نووسینی کورتە تەفسیری سوورەتی (نەحل) .

کۆتایی جزمی ( ١٤ ) چواردە

ولله الحمد والمنة

*** *** ***

## ١٧- سوورەتی ( ئیسرا ) یە.

## مەککەیی یەو ( ١١١ ) ئایەتە.

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

ئەم سوورەتە وەك سوورەتەکانی تر گرنگیی بەبیرو باوەڕدەدات، وەکو یەکخواپەرستیی، پەیامەکەی پێغەمبەر، زیندوو بوونەوە... بەڵام خاڵی سەرەکیی لەم سوورەتە پیرۆزەدا خستنە پێش چاوی کەسایەتی پەیامبەرە ﷺ لەگەڵ ئەوهەموو موعجیزە گرنگانەدا هێناویەتی بۆ ڕاستیی خۆی، هەزاران هەزار سڵاوی لەسەربێت.

* جا لەسەرەتاوە شەوڕەویە پیرۆزەکە کە موعجیزەو بەهرەو خەڵاتێکی گەورەو مەزن بوو خوای گەورە بەخشی بەپەیامبەر ﷺ باسدەکات، لەلایەکیشەوە دەسەڵاتی باڵادەستیی خوا نیشان دەدات کە چۆن بەو ئەندازە ماوە

زۆرکەمەیە، توانی ئەوهەموو ڕێگە درێژەیەی پێ ببڕێ و، سەیران و سەفای ئاسمانی پێ بکاو، هەر لەو ماوەیەشدا بیگێڕێتەوە جێگای خۆی.

* باسی یاخیبوونی هەردووجارەکەی جوولەکەو سەرگەردان بوونییان دەکا، لە تۆڵەی لاڕێی و لاسارییاندا:(وقضينا إلى بني إسرائيل في الكتاب لتفسدن في الأرض مرتين..).

* هەندێ بەڵگە لەسەر گەورەیی وتاك و تەنیایی خوا - وەك شەوو ڕۆژو ئاڵو گۆڕیان- دێنێ: (وجعلنا الليل والنهار آيتين، فمحونا آية الليل..).

* بڕێ لەیاسای کۆمەڵایەتیی و، ڕەوشتە بەرزەکان دەخاتە ڕوو و هانی مرۆڤەکانی بۆ دەدات, هەتا کۆمەڵ و کۆمەڵگەیەکی خاوەن ڕەوشتی بەرز پەیدا ببێت.

* بەچەند بەڵگەیەك باسی سەرگەردانیی هاوەڵدانەرەکان دەکات، هەروەك باسێکی قورئان دەکات کە گەورەترین مۆجیزەیەو، هەتا هەتایە بەرقەرار دەبێت.. لەگەڵ دابەزینە سەرهاوەڵ دانەرەکان، لەکاتێکا کە داوای موعجیزەیەکی تر "جگە لەقورئان" دەکەن.

* پاك و خاوێنی خوا لەشەریك و هاوەڵ باس دەکا: (وقل الحمد لله الذي لم يتخذ ولدا.. وكبره تكبيرا).

لەگەورەیی ئەم سوورەتەیشدا هاتووە - وەك پێشەوا ئەحمەد لە (ئەبو لوبابە) دەگێڕێتەوە - دەڵێ: خاتوو (عائیشە) وتی: ئەوەندە پەیامبەر ﷺ بەڕۆژوو دەبوو ئەمان گوت , نایەوێ هیچ ڕۆژێ لەساڵ بەڕۆژو نەبێ، ئەوەندەش بە ڕۆژوو نەدەبوو، ئەمان گوت ئیتر هەر بەڕۆژوو نابێ، وە هەموو شەوێکیش سوورەتی (بەنی ئیسرائیل) و (زمر)ی دەخوێند.

الجزء الخامس عشر — سورة الإسراء

سورة الإسراء — ترتيبها ١٧ — آياتها ١١١

بسم الله الرحمن الرحيم

سبحان الذي أسرى بعبده ليلا من المسجد الحرام
إلى المسجد الأقصا الذي باركنا حوله لنريه من آياتنا إنه
هو السميع البصير ﴿١﴾ وآتينا موسى الكتاب وجعلناه
هدى لبني إسرائيل ألا تتخذوا من دوني وكيلا ﴿٢﴾
ذرية من حملنا مع نوح إنه كان عبدا شكورا ﴿٣﴾
وقضينا إلى بني إسرائيل في الكتاب لتفسدن في الأرض
مرتين ولتعلن علوا كبيرا ﴿٤﴾ فإذا جاء وعد أولاهما بعثنا
عليكم عبادا لنا أولي بأس شديد فجاسوا خلال الديار
وكان وعدا مفعولا ﴿٥﴾ ثم رددنا لكم الكرة عليهم
وأمددناكم بأموال وبنين وجعلناكم أكثر نفيرا ﴿٦﴾
إن أحسنتم أحسنتم لأنفسكم وإن أسأتم فلها فإذا جاء
وعد الآخرة ليسوءوا وجوهكم وليدخلوا المسجد
كما دخلوه أول مرة وليتبروا ما علوا تتبيرا ﴿٧﴾

عسى ربكم — ٢٨٢

**شەو ڕەوییەکەی پێغەمبەر ﷺ:**

﴿بسم الله الرحمن الرحيم * [١] سبحان الذي أسرى بعبده ليلا﴾ پاکەو خاوێنە لەهەرشتێکی ناپەسەندو خراپ، ئەو خوایەی کە شەوڕەوی بەبەندەی خۆی (موحەممەد) ﷺ کرد لەبەشێکی زۆر کەمی شەوێکدا ﴿من المسجد الحرام إلى المسجد الأقصى﴾ لەمزگەوتی (حەرام)ـەوە لەمەککەدا بۆ مزگەوتەکەی ئەولاتر (بيت المقدس) لەفەلەستیندا، کە ئەو ڕۆژە کاروانیی بەچەندین ڕۆژ ئەوجا دەیگەیشتێ!!

﴿الذي باركنا حوله لنريه من آياتنا﴾ ئەو مزگەوتەی ئێمە دەوروبەریمان پیرۆزو پیتدارکرد بەجۆرەها نیعمەت و میوەو میوەجات و، کردیشمانە بارەگای پەیامبەران، تا هەندێ لە نیشانەکانی دەسەڵات و توانایی خۆمانی پێ نیشان بدەین لەو شەوڕەوییەدا ﴿إنه هو السميع البصير﴾ چونکە هەرئەوە زۆر بیسندە بۆ قسەو گوفتاری مەردم، زۆربیناو بەئاگا، بەئەحواڵی گشت مرۆڤەکان، دەزانێ لەدنیاو لەقیامەتدا شایستەی چین.

* (ئیسرا)و(میعراج) له قۆناغێکی زۆرناسك ومەترسییدار لەژیانی پێغەمبەردا ﷺ بوو، ئەو دەمە کە زۆر ماندو و خەستە بوو، بەلاّم بەم رووداوە گرنگە مێژووییە ئاسۆی ئاسمانی لێدرەوشایەوەو، هیواو ئومێدێکی بەخۆیی و بەیارانی بەخشی، (نەوەویی) و (قورتوبی) دەڵێن: ئەو رووداوەیە پێنج ساڵ پاش پێغەمبەرێتی بوو.خاوەنی کتێبی(الرحیق المختوم) دەڵێ: له (٢٧/ی (ڕەجەب)ی ساڵی (١٠)ی پێغەمبەرایێتیدا بوو، لەگەڵ هەندێ ڕاو بۆچوونی بڕێ لەزاناکانی تر. (ئیبنولقەییم)یش دەڵێ: قسەی راست ئەوەیە کە ئەو شەوڕەویە بە (جەستە)ی پیرۆزی بوو، وە له مزگەوتی (حەرام)ـەوە بۆ مزگەوتی (قودس) بەسواری (بوراق) و هاوڕێتی (جوبریل) ﷺ ,جا له قودس دابەزیی و پێش نوێژی بۆ پێغەمبەرەکان (علیهم الصلاة والسلام) کردو هەر لەوێش (بوراق)ی بە ئەڵقەیەکی دەرگای مزگەوتەکەوە بەستەوە. پاشان هەر ئەو شەوە له (بیت المقدس)ـەوە بەرز کرایەوە بۆ ئاسمانی دنیاو، دەرگای بۆ کرایەوەو هەر لەوێ (بابە گەورە)ی گشتمانی(ئادەم) دیت، سلاّوی لەسەر بێت، بابەیشمان خۆشحاڵی خۆی بەدیتنی دەربڕیی و ددانی نا بە پێغەمبەرێتیدا، هەر لەوێیش خوای خاوەن توانا ڕۆحی گشت شەهیدەکانی ئامادەکردو لەلای راستیەوە نیشانداو، له چەپیشیەوە ڕۆحانیەتی سەرجەم بەدبەختانی نیشاندا. ئەوسا سەرخرا بۆ ئاسمانی دووەم و لەوێ (یەحیا)و(عیسا)ی دیتن (سلاّویان لەسەربێت) ئەوانیش پێغەمبەرێتییان سەلماندو، پاشان بۆ ئاسمانی سێیەم بەڕێکەوت و لەوێش (یوسف)ی دیت (سلاّوی لەسەر بێت) ئەویش بە خێری هێناو ددانی بە پێغەمبەرێتییدا نا، بۆدوایی بەرەو ژوروتر سەرخرا بۆ ئاسمانی چوارەم، لەوێش (ئیدریس) پێغەمبەری دیت و خۆشحاڵ بوو و پێغەمبەرێتی سەلماند، له پاشا سەرخرا بۆ ئاسمانی (پێنجەم) ولەوێش (هارون)ی کوڕی(عیمران)ی دیت، ئەویش پاش بەخێرهێنانی پێخۆشبوونی خۆی دەربڕیی و ئیقراری بەپێغەمبەرێتی کرد، له ئاسمانی (شەشەم)یشدا بە (موسا) گەیشت و، ئەویش هەر وەکو پێغەمبەرەکانی تر پێشوازی لێکرد، جاکاتێ لەوێ تێپەڕی مووسا گریا! گوتیان بۆچی دەگریت؟ گوتی: چونکە لەبەهەشتدا ئوممەتی ئەم پێغەمبەرە، له ئوممەتی من زیاترە، وە له ئاسمانی (حەوتەم)یشدا بە(ئیبراهیم) شاد بوو، پاش بەخێرهێنان و خۆشحاڵی و ددانان بەپێغەمبەرێتییدا له لایەن ئەویشەوە(سەلاّویان لەسەر بێت) چوویە (سدرة المنتهی)، پاش ئەو(بیت المعمور)، ئەوجا بەرزتر چوو تا بەدیداری خوای گەورەشاد دەبێ ولێیەوە نزیك دەبێتەوە، هەر بەقەد دوو (کەوانی) ما، یان نزیکتر، لەوێ هەرچی پێویست بوو بۆئەو قۆناغە وەحیی بۆکردو تێیگەیاند، لەوانە (٥٠) ڕکات نوێژی لەسەر ئوممەتەکەی فەرز کرد، پاشان بەتەگبیرو راوێژی موسا ﷺ تکای لەخوای میهرەبان کرد هەتا بۆی کەمکردەوە و کردی بەم(٥) نوێژەی ئێستا.

جا لەم سۆنگەیەوە (ئیبن تەیمییە) دەڵێ: هیچ هاوەڵێکی پێغەمبەر ﷺ نەیگوتووە پێغەمبەر ﷺ خوای گەورەی دیتووە، (ئیبن عەباس) نەبێ ئەویش (خاتوو عائیشە) بەرهەڵستی دەوەستێ. (ئیبنولقەییم) دەڵێ: ئەو نزیکبوونەوەیە کە لەسوورەتی (نەجم)دا باسکراوە، مەبەست پێی نزیکبوونەوەی (جبریل)ـە ﷺ وەکو خاتوو (عائیشە)و(ئیبن مەسعود) دەڵێن. ئەم باسەیە لەسوورەتی (نەجم)دا بەروونتر رۆشن کراوەتەوە.

**خوێنەری هێژا:** باسی(ئیسرا) له یەك ئایەتداو، پاشان باسی تاوانەکانی (بەنی ئیسرائیل) بەدوای ئەوداو، دواتر کە دەڵێ: ئەم قورئانە باشترین ڕێباز دەست نیشان دەکا.. ئەمانە هەموو هێماو ئاماژەن کە (یەهوود) لەسەرکردایەتی دەردەکرێن و، دەدرێتە دەستی ئەم پێغەمبەرە تازەیەو قورئانیش بەرنامەی دەبێت، چونکە (یەهوود) ئەوەندە تاوانی کرد، کەڵکی رابەرایەتییان نەماو، خوای گەورەیش لێی سەندنەوەو تەسلیمی

(موحەممەد)ی ﷺ کرد، کەوابوو پێویستە رابەرایەتی کردنی هەر ئوممەتێك پڕ بێت لە دادگەریی و دادپەروەریی و، ئەخلاق و قییەم و داوێن پاکی و دەستپاکیی و، هەوڵ و تێکۆشان و جیهادولێڕان و، لێبوردن و جورئەت و ئازایەتی و، بێ خیانەت و گزیی و فرت و فێڵ لەگەڵ گەلەکەیدا. ئەگینە خوای گەورە قبوڵی ناکاو دیزەو گۆزەی سەر نخون دەکا، ئەگەرچی زۆریشی پێ بچێت. هیوادارم ئەم ئوممەتی ئیسلامە بەهۆی ئەم سیفەتە پڕشکۆدارانەوە بتوانێ قیادەی دنیا بکات. بۆ نووسینی ئەم کورتەیە سوودم لەکتێبی (الرحيق المختوم)ی (صفي الرحمن المباركفوري) وەرگرت.

## مووساو تەوراتەکەی:

﴿[٢] وآتينا موسى الكتاب﴾ وەکتێبی (تەورات)یشمان بەمووسا دا ﴿وجعلناه هدى لبني إسرائيل﴾ و کردمانە رێنمایی بۆ (بەنی ئیسرائیل) ﴿الا تتخذوا من دوني وكيلا﴾ پێمان گوتن: نابێ بێجگە لە من (خوا) هیچ کەس بکەنە بریکاری خۆتان ﴿[٣] ذرية من حملنا مع نوح﴾ ئەی نەوەو زاڕۆی ئەوانەی کە لە گەڵ (نووح)دا کاتی خۆی سواری کەشتیمان کردن و لەتۆفانەکە رزگارمان کردن،ئێوەیش وەکو (نووح) سوپاسی خوا بکەن ﴿إنه كان عبدا شكورا﴾ چونکە بە راستیی ئەو بەندەیەکی شوکرانە بژێر بوو، دەسا ئێوەش باسی چاکەی من بکەن بەسەرخۆتانەوە بە ناردنی(محمد) بۆتان , وەهەر ئەو پێغەمبەرە لە بارەی شوکرانە بژێری خواوە دەفەرموێ:(إن الله ليرضى عن العبد أن يأكل الأكلة، أويشرب الشربة فيحمد الله عليها) پێشەوا ئەحمەد. لە فەرموودەیەکدا هاتووە کە لە قیامەتدا ئەم خەڵکە گشت دەچن بۆ لای نووح تکاو شەفاعەتیان بۆ بکاو, دەڵێن: (يانوح إنك أول الرسل إلى أهل الأرض، وقدسماك الله عبدا شكورا، فاشفع لنا إلى ربك) فتح الباري:٦ /٤٢٨.

## جوولەکە دووجار یاخی دەبن:

﴿[٤] وقضينا إلى بني إسرائيل في الكتاب﴾ جاهەر لەوکتێبەی تەوراتەدا، یان لە (لوح المحفوظ)دا ئاگاییمان بە نەوەی ئیسرائیل دا ﴿لتفسدن في الأرض مرتين﴾ کە بە راستیی ئێمە لە(ئەزەل)دا دەزانین: ئێوە لە وڵاتی (میسر)دا دووجار فەسادو گێرە شێوێنی دەکەن وناهەقیی بەرامبەر مەردم دەکەن، بەڵێ وابوو، ئەوەبووجاری یەکەمیان هەستان (زەکەریا) پێغەمبەریان کوشت، ئینجا لەتۆڵەی ئەوەدا خوای گەورە (بەختەنەصر)ی بەسەریاندا زاڵکردو، کوشتارێکی زۆری لێکردن و (بيت المقدس)یشی وێران کرد.

جاری دووەمیشیان (یەحیا) پێغەمبەریان کوشت، خوایش دیسانەوە دوژمنی خۆیانی بەسەریاندا زاڵکردو دووبارە کوشتارێکی زۆری لێکردن و، حەفتا هەزاریشیان لێ دیل کران، چونکە بێ باوەڕبوون و سەرپێچییان لێکرد ﴿ولتعلن علوا كبيرا﴾ وە بەراستیی بەسەر خەڵکی ئەو کاتەدا یاخیی دەبن و سەردەکەون, بەسەرکەوتنێکی زۆر گەورەو، گەشەدەکەن و دەسەڵات بە دەست دەگرن، ئەوجا بادی هەوادەبن و خەڵکی دەچەوسێننەوەو خوایش تووڕە دەبێ لێتان ﴿[٥] فإذا جاء وعد أولاهما﴾ ئینجا هەر کە کاتی تۆڵەی یەکێك لە دووانەکە هاتەپێش, بۆ ئەوەی بیانگرین و سزایان بدەین ﴿بعثنا عليكم عبادا لنا﴾ بەندە زۆر ئازاو تایبەتییەکانی خۆمان (جالووت) ناردە سەرتان ﴿أولي بأس شديد﴾ کە بەڕاستیی لەجەنگدا خاوەن هەڵمەتی توندو تیژو بەووزە بوون ﴿فجاسوا خلال الديار﴾ ئەوانیش بەناو گشت وڵاتدا, تەنانەتی بەناو ماڵەکانیشتاندا –ماڵ بەماڵ– گەڕان بۆ گرتنی تاوانبارەکانتان ﴿وكان وعدا مفعولا﴾ وە ئەم بڕیاری لەناوبردن و تۆڵەیەتان، بڕیارێکە لەلایەن خواوە دراو جێبەجێش بوو ﴿[٦] ثم رددنا لكم الكرة عليهم﴾ لەپاشان کارێ وامانکرد کە ئێوە ئەی جووەکان! بەسەریاندا زاڵ ببنەوە ﴿وأمددناكم بأموال وبنين﴾

پاش ئەوەش کە ئەوان تالانیان کردن و کوڕەکانیشتانیان کوشت، ئێمە ماڵ و کوڕانتانمان زیاد کردەوە ﴿وجعلناكم اكثر نفيرا﴾ و ژمارەی پیاوان و، دەسەڵاتیشتان لەدوژمنەکانتان زیاتر بوو، ئەوەبوو پاش ئەوە توانیتان (بابلی)یەکان دەرکەن و دیلەکانیشتان ئازاد بکە و دەسەڵاتیان لێ وەرگرنەوە ﴿٧ إن احسنتم﴾ جا ئەگەر لەکاتی دەسەڵاتدا ئێوە چاکە بکەن و فەرمانی خوا بەجێ بهێنن ﴿احسنتم لأنفسكم﴾ دیارەهەر بۆ خۆتان چاکەتان کردووەو خۆتان کەڵکی لێ وەر ئەگرن ﴿وإن اسأتم فلها﴾ وخۆ ئەگەر خراپەیش بکەن، ئەوە تۆڵەکەی هەر بۆ خۆتان دەبێت، ئەوەبوو هەر کە خراپەتان کرد، دوژمن زاڵ بوو بەسەرتانا، کە گەڕاشنەوە بۆ لای خوا زاڵ بوونەوە بەسەریاندا ﴿فإذا جاء وعد الآخرة﴾ ئینجا کاتێ سەرەی ئەنجامدانی بەڵێنی دوایی هاتە جێ بۆ تۆڵەتان" ئەو دەمەی کە (یەحیا)تان کوشت ﴿ليسوؤا وجوهكم﴾ جا لەتۆڵەدا بەندەکانمان دەنێرینە سەرتان کارێکتان پێ بکەن کە نیشانەی خەمۆکی لە ڕوخسارو ناو چاوتاندا دیاربێت, بە بەدیل کردن و کوشتنتان, واتە: نیشانەی ڕیسوایی بەنێو چاوانتانەوە دەرکەوێ ﴿وليدخلوا المسجد﴾ و ئەو دوژمنانەش بچنە مزگەوتی (قدس)ـەوەو لەپێش چاوتانەوە بیڕوخێنن و دەسەڵاتیشتان نەبێ هیچ بکەن ﴿كما دخلوه اول مرة﴾ هەروەکو جاری یەکەمیش چوونە ناویەوە، کاتێ دەستتان کرد بەخراپەکاریی و (زەکەریا)تان شەهید کرد ﴿وليتبروا ما علوا تتبيرا﴾ وتا دەستیان بەسەر هەر جێیەکیشیان گرت وێرانی بکەن و بەتەواوی بەسەرتانا زاڵ بن. **مێژوو ئەڵێت**: بۆ یەکەم جار (بەختە نەصر) هێرشی بۆ بردن و(بیت المقدس)یشی وێران کرد، بۆجاری دووەمیش (اسبیانوس)ی پاشای ڕۆمەکان بوو، وە ماوەی هەردووهێرشەکە نزیکەی (٥٠٠) ساڵ بوو ﴿٨ عسى ربكم ان يرحمكم﴾ بێگومان لەکاتی ئاوادا پەروەردگارتان دەتان خاتە بەر ڕەحمەتی خۆی، ئەگەر پەشیمان ببنەوە. ڕاڤەکەرانی قورئان دەڵێن: (وعسى: من الله واجبة)واتە: هەرکردارێکی (عسى) بکارەکەی خوا بێت، حەتمییەت دەگەیەنێت ﴿وإن عدتم عدنا﴾ خۆ ئەگەر تێ هەڵچنەوە بۆ سەرپێچیی و پیاوکوشتن، ئەوا ئێمەیش تێهەڵدەچینەوە بۆ کاری خۆمان و، دووبارە دوژمن زاڵ دەکەینەوە بەسەرتاندا، بەڵێ.. لەسەدەکانی دواییشدا جارێ موسڵمانەکانی زاڵکرد بەسەر یاندا، ئەوەبوو لە نیوەدورگەی عەرەبیی دەریان پەڕاندن، لەم دواترەیشدا(هتلر) دەستی گرت بەسەریاندا، ئێستایش کە دنیا بەگیر هاتووە بە دەستیانەوە، بێگومان خوا کۆمەڵە خەڵکێکی باش و شیاو بەر دەداتە گیان و ملیان با دەدەن، چونکە بەڵێنی خوا خۆیەتی کەهەرکات ڕوویانکردەوە فەساد، هێزێکی وریاو زرنگیان بۆدەنێرێت ﴿وجعلنا جهنم للكافرين حصيرا﴾ ودۆزەخیشمان کردە زیندان و بەندیخانە بۆ بێ باوەڕەکان.

الجزء الخامس عشر — سورة الإسراء

عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يَرْحَمَكُمْ وَإِنْ عُدتُّمْ عُدْنَا وَجَعَلْنَا جَهَنَّمَ لِلْكَافِرِينَ
حَصِيرًا ﴿٨﴾ إِنَّ هَٰذَا الْقُرْآنَ يَهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ وَيُبَشِّرُ
الْمُؤْمِنِينَ الَّذِينَ يَعْمَلُونَ الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا ﴿٩﴾
وَأَنَّ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ أَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٠﴾
وَيَدْعُ الْإِنسَانُ بِالشَّرِّ دُعَاءَهُ بِالْخَيْرِ وَكَانَ الْإِنسَانُ عَجُولًا ﴿١١﴾
وَجَعَلْنَا اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ آيَتَيْنِ فَمَحَوْنَا آيَةَ اللَّيْلِ وَجَعَلْنَا آيَةَ
النَّهَارِ مُبْصِرَةً لِّتَبْتَغُوا فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ وَلِتَعْلَمُوا عَدَدَ
السِّنِينَ وَالْحِسَابَ وَكُلَّ شَيْءٍ فَصَّلْنَاهُ تَفْصِيلًا ﴿١٢﴾ وَكُلَّ
إِنسَانٍ أَلْزَمْنَاهُ طَائِرَهُ فِي عُنُقِهِ وَنُخْرِجُ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كِتَابًا
يَلْقَاهُ مَنشُورًا ﴿١٣﴾ اقْرَأْ كِتَابَكَ كَفَىٰ بِنَفْسِكَ الْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا
﴿١٤﴾ مَّنِ اهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِي لِنَفْسِهِ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ
عَلَيْهَا وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ
رَسُولًا ﴿١٥﴾ وَإِذَا أَرَدْنَا أَن نُّهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُوا فِيهَا
فَحَقَّ عَلَيْهَا الْقَوْلُ فَدَمَّرْنَاهَا تَدْمِيرًا ﴿١٦﴾ وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِنَ
الْقُرُونِ مِن بَعْدِ نُوحٍ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ بِذُنُوبِ عِبَادِهِ خَبِيرًا بَصِيرًا ﴿١٧﴾

٢٨٣

### گەورەیی و مەزنیی قورئان:

﴿[٩] إن هذا القرآن یهدی للتی هی اقوم﴾ بێگومان ئەم قورئانە بۆمان ناردون، ڕێگا و بەرنامەیەکی وا نیشانی خەڵکی دەدا، کە ڕاسترین بەرنامەو ڕێگایە.

بەڵێ.. لە هەموو کات و ساتێکدا، وەبۆ هەرکەسێك ئامادەیی تێدا بێت ئەم قورئانە ڕێ نیشاندەر بووەو، دەرەنجامیش بۆتە سەرکردەی دنیا ﴿ویبشر المؤمنین الذین یعملون الصالحات﴾ ومژدەیش دەدا بەو بڕوادارانەی کە کارو کردەوەی چاك ئەنجام دەدەن:﴿أن لهم اجرا کبیرا﴾ کە بەڕاستیی پاداشێکی زۆر گەورەیان بۆ هەیە لەبەهەشتدا ﴿[١٠] وان الذین لا یؤمنون بالآخرة﴾ و بەڕاستیی ئەو کەسانەش کەبەدوا ڕۆژ بڕوا ناکەن ﴿اعتدنا لهم عذابا الیما﴾ سزایەکی زۆر ئێش پێکەیەنەرمان بۆ ئامادە کردوون ﴿[١١] ویدع الإنسان بالشر دعاءه بالخیر﴾ و مرۆڤ چۆن قینی هەڵ دەسێ و تەنگەتاو دەبێ و نزای شەڕەکا لەماڵ ومنداڵی خۆی دەڵێت: خوا بتکوژێ، خوا لەناوتبەرێ، هەر ئاواش لەکاتی ئاساییدا دوعا بۆ چاکە دەکا" جا ئەگەرخوای گەورە وەڵامی نزا شەڕەکەی بداتەوەو دۆعاکەی گیرا بکات، ئەوا زۆر زوو خۆیی و ماڵ ومنداڵی لەناو دەچێ وگیرۆدە دەبن، لە فەرموودەیەکدا هاتووەو دەفەرموێ: ((لاتدعوا علی انفسکم، ولا علی أموالکم، أن توافقوا من الله ساعة إجابة یستجیب فیها))موسلیم. واتە: هەرگیز دۆعا لەخۆتان و ماڵ و منداڵتان مەکەن، نەوەك بەر ئەوکاتە بکەوێت دۆعای تیا گیرا دەبێت و وەڵام بدرێنەوە. ﴿وکان الإنسان عجولا﴾ و مرۆڤ هەمیشە و بەردەوام هەر بەپەلە و هەڵەشەبووە، نەیزانیوە بەرژەوەندیی لە چیدایە.

### شەوو ڕۆژ نیشانەی دەسەڵاتی خوان:

﴿[١٢] وجعلنا الیل والنهار آیتین﴾ وە ئێمە دیاردەی شەوو ڕۆژمان بەدووبەڵگەو نیشانە لەسەر تاك وتەنیایی ودەسەڵاتی خۆمان نیشاندان ﴿فمحونا آیة الیل﴾ ئینجا دیاردەی تاریکیمان بەسەر شەودا هێنا, واتە: ڕووناکی ڕۆژمان پێ لابردو، تاریکی سەری دەرهێنا، هەتا ئێوە تێیدا بحەوێنەوە ﴿وجعلنا آیة النهار مبصرة﴾ و دیاردەو نیشانەی ڕۆژیشمان (خۆر) بەئاشکراو بینراو سازاند ﴿لتبتغوا فضلا من ربکم﴾ بۆ ئەوە ئێوە بگەڕێن بە دوای ئەو ڕسق و ڕۆزیەدا پەروەردگارتان بەهرەوەرتان دەکاو دەیدا پێتان ﴿ولتعلموا عدد السنین والحساب﴾ و تابشتوانن بەئاسانی ژمارەی ساڵەکان و، حیسابی شەوو ڕۆژ چاك بزانن، دەسا لەبەرامبەر ئەو بەخششانەوە شوکرانە بژێر بن ﴿وکل شئ فصلناه تفصیلا﴾ وە بەڕاستیی هەرشتێك کە ئێوە نیازتان پێی هەبێ لەدنیاو لەقیامەتدا ئێمە بە وردیی شیمان کردۆتەوە بۆتان، واتە: هیچ شتێك لەم بوونەوەرەدا بێ بەرنامەو حیساب نەماوەتەوە، لە ئایەتێکی تردا هەر لەو بارەیەوە دەفەرموێ: (هوالذی جعل الشمس ضیاء والقمر نورا وقدره منازل لتعلموا عدد السنین والحساب ماخلق الله ذلك إلا بالحق..).

### هەموو مرۆڤێك لە ڕۆژی سەلادا بە کارنامەی خۆیەوە دێت:

﴿[١٣] وکل إنسان الزمناه طائره فی عنقه﴾ ئیتر هەموو مرۆڤێك کردەوەکەیمان –خێرو شەڕ کە لە شەوو ڕۆژ دا کردنی– ئاوێزانیملی کرد, واتە: لە قیامەتدا نامەی هەموو کاروکردەوەی مرۆڤ وەك (تەوق)و ملوانکە دەکرێتە ملی و، هەربە پێی ئەوەش لەقیامەتدا پاداش و تۆڵە وەردەگرێتەوە، لەسوورەتێکی دیکەدا هەر لەو بارەوە دەفەرموێ: (فمن یعمل مثقال ذرة خیرا یره ومن یعمل مثقال ذرة شرا یره) ﴿ونخرج له یوم القیامة کتابا﴾ وە لەڕۆژی قیامەتدا نامەیەکی– کە کردەوەکانی تیانووسراوە– بۆ دەردێنین ﴿یلقاه منشورا﴾ و ئەویش بەکراوەیی دەگابەونامەیە و لێی

تێدەگات ﴿[١٤] إقرا كتابك كفى بنفسك اليوم عليك حسيبا﴾ پێی دەگوترێ: دەسا بۆ خۆت نامەی کردەوەکانت بخوێنەوە، ئەمڕۆ ئیتر هەر تۆ خۆت حیساب لەگەڵ خۆت بکێشەو پێویست بەکەسی تر ناکا، ئەوجا ئەویش خوێندەوار بێ، یا نە، بۆ خۆی کارنامەکەی دەخوێنێتەوەو، باش لە ئەنجام و جێ وشوێنی خۆی تێدەگات، لە سوورەتی(قیامە)دا دەفەرموێ: (ینبأ الإنسان یومئذ بما قدم وأخر، بل الإنسان على نفسه بصيرة ولو القى معاذيره).

## کەس تاوانی کەس هەڵناگرێ:

﴿[١٥] من اهتدى فإنما يهتدي لنفسه﴾ ئەوی ڕێگای هەق وراستی بگرێ, ئەوەبۆ خۆی شارەزا بووە، واتە: قازانج و پاداشەکەی هەر بۆ خۆی دەبێ و، لەو ڕۆژەیشدا سەر فراز دەبێت ﴿ومن ضل فإنما يضل عليها﴾ هەر کەسێکیش ڕێگە گوم بکاو لاڕێ بێ، ئەوەش تەنها سەر لەخۆی دەکەوێ و، زیان و تۆڵەکەی لەسەر خۆیەتی و هەر خۆی گیرۆدە دەبێت ﴿ولا تزر وازرة وزر أخرى﴾ وکەسیش تاوان و گوناهی کەسی تر هەڵناگرێ، ئەگەرچی (وەلید) ئاسایەکی خوانەناسیش بەڵێنی پێدابن کە: گوناحەکانیان هەڵبگرێ، مەگەر دەستی هەبێت لەو تاوانانەدا، لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: (وإن تدع مثقلة إلى حملها لايحمل منه شيئا ..)، ﴿وما كنا معذبين حتى نبعث رسولا﴾ وئێمە تۆڵەوسزای هیچ خەڵکێکمان نەداوە، هەتا پەیامبەرێکیان بۆ نەناردبن ڕێیان بۆ ڕۆشن بکاتەوە, قورئان بۆ خۆی پڕە لەو بابەتە، بۆ نموونە: (كلما القى فيها فوج سألهم خزنتها الم يأتكم نذير قالوا بلى قد جاءنا نذير فكذبنا ..) لێرەدا ئەم پرسیارە دەکرێت: ئاخۆ ئەو منداڵانەی بە منداڵی دەمرن و باوك و دایکیان کافرو خوانەناسە، یان شێت و کەڕو کاس و پیری خەرەفاوە، یان خەڵکی (فەترەت)ە و هیچی نەبیستووە، دەبێ لە قیامەتدا چ بکەن؟ هەندێ زانا دەڵێن: دەوەستین و لەو بارەوە هیچ ناڵێین. هەندێکیش دەڵێن: بێ شك بەهەشتین. هیواشیان هەیە دەڵێت: جەهەنەمین، دیارە بۆ هەریەکەشیان بەڵگە هەیە، بەڵام بەپێی (عەدل)ی خوایی دەبێ بەهەشتیی بن، ئەگەرچی خۆنەدان لەم شتانە باشترە. ﴿[١٦] وإذا اردنا أن نهلك قرية امرنا مترفيها﴾ وکاتێکیش ویستبێتمان شارو ئاوایییەك لەناو بەرین، ئەوا بەفەرمانێکی(ئەزەل)یی فەرمانداوە - بەتایبەتی بەسەرکردە یاخیی و خۆشگوزەرانەکانیان -کە فەرمانی پەیامبەران جێبەجێ بکەن و گوێڕایەڵیان بن ﴿ففسقوا فيها﴾ جا ئەوانیش لەباتی گوێڕایەڵیی، نافەرمانی و سەرپێچیان تیا کردووەو لێی دەرچوون ﴿فحق عليها القول﴾ بەوە سزایان بە سەرا سەپاوە ﴿فدمرناها تدميرا﴾ ئەوجائێمەیش بە سەختی کاولمان کردووە، چونکە خۆیان بەڵگەیان بەدەستەوەداین، لە جێگایەکی تردا هەر لەو بارەیەوە دەفەرموێ: (وكذلك جعلنا في كل قرية أكابر مجرميها ..). خاتوون (زەینەب) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ (أنهلك وفينا الصالحون؟ قال: نعم، إذا كثر الخبث) متفق عليه. واتە: ئاخۆ ئێمە "لەوحاڵەتانەدا" ئەر خەڵکی باشیشمان تێدابێ هەر تیادەچین؟! فەرمووی: کەکاری خراپەو بەدرەوشتانە سەری هەڵدا بەڵێ ئێوەش لەگەڵ ئەواندا تیادەچن، ئەگەرچی دەستیشتان لەو شتانەدا نەبێ ﴿[١٧] وكم اهلكنا من القرون من بعد نوح﴾ وە زۆر لە خەڵکی سەدەکانمان بە هۆی لاساریانەوە لەناو برد ئەی هۆزی قورەیش! دوای گەلەکەی (نووح) , وەکو گەلانی (عاد)و (سەموود)و (فیرعەون) کە ئەوانیش هەروەك ئێوە لاسار بوون و بڕوایان نەهێنا، دەخۆ ئێوە لەوان نازار تر نین ﴿وكفى بربك بذنوب عباده خبيرا بصيرا﴾ هەر ئەمەش بەسە کە پەروەردگارت ئەی موحەممەد! ﷺ لە تاوان و گوناهی بەندەکانی خۆی ئاگادارو بینایەو، هیچ شتێکی لێ بزر نابێت.

## کێ دنیای دەوێ و کێش ڕۆژی پەسڵان؟

﴿[١٨] من كان يريد العاجلة عجلنا له فيها ما نشاء لمن نريد﴾ هەرکەسێك لەکاروکردەیدا تەنیا دنیا ویستی بکات، کە دنیاش بە پەلە تێدەپەڕێ، ئەوا ئێمەیش حەزمان لە هەر کەسێك هەبێ، بە زوویی ئاوات و ویستەکەی پێکدێنین و دنیای دەدەینێ ﴿ثم جعلنا له جهنم يصلاها مذموما مدحورا﴾ لەپاشان لەقیامەتدا بەسەر زەنشت کراویی و دوور خراوەیی لەمیهرەبانیی خوا ، دۆزەخمان بۆداناوەو دەیبرژێنێ، جا ئیتر ئێستا کە لە دنیادایە ئارەزووی خۆیەتی کار بۆ دنیای دەکات، یان بۆ قیامەتی ﴿[١٩] ومن اراد الآخرة وسعى لها سعيها وهو مؤمن﴾ وە هەرکەسیش پاشە ڕۆژی لامەبەست بێ و هەوڵیشی بۆ بداو، لەهەمان کاتیشدا بڕوادار بێت بەخواو بە بەرنامەکەی خوا ﴿فأولئك كان سعيهم مشكورا﴾ هەوڵ و کۆششی ئەمانە جێگەی سوپاسەو، بەچەند بەرامبەریش پاداشی لە سەر وەردەگرن ﴿[٢٠] كلا نمد هؤلاء وهؤلاء من عطاء ربك﴾ هەریەك لەو دوو تاقمە چ دنیا ویستەکان و، چ قیامەت خوازەکان، لەبەخششی پەروەردگارت، لە دنیادا گشت بەهرەوەر دەکەین و، بەماڵ و سامان و خۆشگوزەرانیی هاوکارییان دەکەین، واتە: بەکافرو بڕوادار وەکو یەك ڕزق و ڕۆزی دەدەین، پاشانیش هەر کەسە لە قیامەتدا کوێ هەڵبگرێت دەیدەینێ ﴿وما كان عطاء ربك محظورا﴾ خۆ لەم دنیایەشدا بەخششی پەروەردگارت لەهیچ کەسێ قەدەغە کراونیە ﴿[٢١] انظر كيف فضلنا بعضهم على بعض﴾ دەسا بڕوانەو سەرنج بدە ئەی پێغەمبەر! ﷺ چۆن هەندێکیانمان -لەدونیادا- بەرز کردۆتەوە بەسەر هەندێکیاندا، وا دەبێ موسڵمان و کافر هەردوو ڕزق و ڕۆزی باشیان دەدەینێ، واش دەبێ هەردوویان نەبوون و نایاندەینێ، وایش دەبێ موسڵمانیشەو بژێوی کەمە، یان هەر نیەتی، چونکە ڕزق و ڕۆزی بەدەست ئەوان نیە ﴿وللآخرة اكبر درجات واكبر تفضيلا﴾ بێگومان پلەو پایەکانی پاشەڕۆژ بۆ بڕواداران گەورەترو زیدەترە، ئەگەر چی لەدنیادا بژێوییان باش نەبێت، لەم بارەوە ئەم فەرموودەیە هاتووەو دەڵێت: ((إن أهل الدرجات العلى ليرون أهل عليين، كماترون الكوكب الغابر فى أفق السماء)) فتح البارى: ٦ /٣٨٦. ﴿[٢٢] لا تجعل مع الله إلها آخر﴾ هەرگیز نەکەیت ئەی مرۆڤ! هاوتاوهاوبەش بۆ خوا دابنێیت، چونکە ئەو تاك و تەنیاو بێ هاوتاو بێ هاوبەشە ﴿فتقعد مذموما مخذولا﴾ دەنا ئەوکاتە بەسەر زەنشت کراویی و، بێ یارو یاوەر بەرامبەر بە (شیرك)ەکەت دادەنیشیت، واتە: خوای گەورە لێت ناپرسێتەوەو دەرووت لێناکاتەوە.

سُورَةُ الإِسْرَاءِ　　الجُزْءُ الخَامِسَ عَشَرَ

مَّن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعَاجِلَةَ عَجَّلْنَا لَهُۥ فِيهَا مَا نَشَآءُ لِمَن نُّرِيدُ ثُمَّ
جَعَلْنَا لَهُۥ جَهَنَّمَ يَصْلَىٰهَا مَذْمُومًا مَّدْحُورًا ﴿١٨﴾ وَمَنْ أَرَادَ
ٱلْـَٔاخِرَةَ وَسَعَىٰ لَهَا سَعْيَهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ كَانَ
سَعْيُهُم مَّشْكُورًا ﴿١٩﴾ كُلًّا نُّمِدُّ هَـٰٓؤُلَآءِ وَهَـٰٓؤُلَآءِ مِنْ عَطَآءِ
رَبِّكَ وَمَا كَانَ عَطَآءُ رَبِّكَ مَحْظُورًا ﴿٢٠﴾ ٱنظُرْ كَيْفَ فَضَّلْنَا
بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ وَلَلْـَٔاخِرَةُ أَكْبَرُ دَرَجَـٰتٍ وَأَكْبَرُ تَفْضِيلًا
﴿٢١﴾ لَّا تَجْعَلْ مَعَ ٱللَّهِ إِلَـٰهًا ءَاخَرَ فَتَقْعُدَ مَذْمُومًا مَّخْذُولًا ﴿٢٢﴾
٢٩ ۞ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَـٰنًا إِمَّا
يَبْلُغَنَّ عِندَكَ ٱلْكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ
أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا ﴿٢٣﴾ وَٱخْفِضْ
لَهُمَا جَنَاحَ ٱلذُّلِّ مِنَ ٱلرَّحْمَةِ وَقُل رَّبِّ ٱرْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِى
صَغِيرًا ﴿٢٤﴾ رَّبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا فِى نُفُوسِكُمْ إِن تَكُونُوا۟ صَـٰلِحِينَ
فَإِنَّهُۥ كَانَ لِلْأَوَّٰبِينَ غَفُورًا ﴿٢٥﴾ وَءَاتِ ذَا ٱلْقُرْبَىٰ حَقَّهُۥ
وَٱلْمِسْكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَلَا تُبَذِّرْ تَبْذِيرًا ﴿٢٦﴾ إِنَّ ٱلْمُبَذِّرِينَ
كَانُوٓا۟ إِخْوَٰنَ ٱلشَّيَـٰطِينِ وَكَانَ ٱلشَّيْطَـٰنُ لِرَبِّهِۦ كَفُورًا ﴿٢٧﴾

٢٨٤　　وَإِمَّا تُعْرِضَنَّ

**یەك خوا پەرستیی و چاكە كردن لە گەڵ باوك و دایكدا:**

﴿[٢٣] وقضى ربك الا تعبدوا إلا أياه﴾ پەروەردگارت بڕیاریداوەو وەسیەتی كرد كە: دەبێ هەر خۆی بپەرستن ﴿وبالوالدين إحسانا﴾ وە فەرمانیداكە: دەبێ لەگەڵ دایك و بابدا چاكە بكەن، وەكو دەفەرموێ: (أن اشكر لي ولوالديك إلى المصير) ﴿إما يبلغن عندك الكبر احدهما أوكلاهما﴾ جاهەركات یەكێكیان یان هەردووكیان -كە لەلای تۆن - تووشی پیریی و لاوازیی بوون ﴿فلا تقل لهما اف﴾ هەرگیز نەكەیت وشەیەكی بێزارییان پێ بڵێیت , تەنانەتی بەرامبەریان ئۆفێكیش مەكە ﴿ولا تنهرهما﴾ و هەرگیز پیایانا هەڵمەشاخێ و بەسەریاندا مەنەڕێنە ﴿وقل لهما قولا كريما﴾ و هەمیشەیش بەوشەی ئەدەب و وێڵی جوان و پیاوانە قسەیان لەگەڵ بكە ﴿[٢٤] واخفض لهما جناح الذل من الرحمة﴾ و باڵی رەحمەت و میهرەبانیان بۆ بێنە خواریێ و، بەرامبەریان هەمیشە خۆت كەم و بچووك بگرە ﴿وقل رب ارحمهما كما ربياني صغيرا﴾ و نزا بكەو بڵێ: پەروەردگاری من! هەر وەكو ئەوان بە شلكی و بەبچووكی لەلەداری منیان كردو رەحمیان پێكردم، دەسا تۆیش لەم پیریی و كەنەفت بوونەیاندا رەحمیان پێ بكەو" میهرەبانبە لە گەڵیان، پێغەمبەریش دەفەرموێ: خوایە! هەر كەسێك دایك وبابی نەیبەنە بەهەشتەوە(واتە: كارو رەفتاری باش نەبێت لەگەڵیاندا) سەر فراز نەبێت ﴿[٢٥] ربكم اعلم بما في نفوسكم﴾ پەروەردگاری ئێوە لەخۆتان چاكتر دەزانێ چی لەدڵتانایە بەرامبەریان، ئاخۆ دەتانەوێ چاكەیان لەگەڵ بكەن، یان ئەزیەتیان بدەن ﴿إن تكونوا صالحين﴾ خۆئەگەر ئێوە ویستتان باش و صالح بن لەگەڵیاندا، كەچی بە (لا ئیرادیی) زەللەیەكتان كرد بەرامبەریان ﴿فإنه كان للأوابين غفورا﴾ بەڕاستیی خوا بۆ تەوبەكاران و پەشیمانان زۆر لێبوردەیە. بەڵێ.. لەقورئانی پیرۆزدا "بەدەر لە فەرموودەكان" زۆر جەخت كراوەتەوە لەسەر چاكە كردن لەگەڵ باوك و دایكدا، چونكە:

١- باوك و دایك زۆر نرخێنراون لەئیسلامدا، بەجۆرێك پاش باسكردنی یەكتاپەرستیی داوا دەكات لەگەڵ ئەواندا چاكە بكەن.

٢- گرنگیدان و وەسیەت بەكاری چاك كردن لەگەڵیاندا گەیشتۆتە پلەیە كە ئەگەر باوك و دایك بێ باوەڕیش بن هەر دەبێ ڕێزیان لێ بگیردرێت.

٣- سوپاسی باوك و دایك و ڕێزو حورمەت گرتنیان لە گەڵ جێگای قورئاندا فەرمانی پێكراوە، هەروەكە چۆن فەرمان بە سوپاسی خوا لە بەرامبەر نیعمەتەكانیەوە كراوە.

٤- جیهاد ئەگەر لەپلەی فەرزی(عەین)دا نەبێ، خزمەتی دایك و باوك گرنگترە لەو، وە ئەگەر لەودەمەدا رازی نەبوون و پێی نارەحەت بن نابێ بچێت.

﴿[٢٦] وآت ذا القربى حقه﴾ و لە چوار چێوەی شەرعدا مافی هەموو خزم و خوێشان بدەو، چاكەیان لەگەڵ بكەو، سەریان لێ بدە، لە فەرموودەكەیشدا پاش دایك و باوك، باسی خزمان دەكا و دەفەرموێ: ((ثم الأقرب فالأقرب)) ﴿والمسكين وابن السبيل﴾ و بێ نەواو ڕێبواریش بێ بەش مەكەو چاوت لێیانەوە بێت، چونكە ئەوانیش لێقەوماون و خاوەن مافن ﴿ولا تبذر تبذيرا﴾ وە نابێ زیادە ڕەوو هەڵە خەرج بیت، بەڵكو دەبێ میانە ڕەوانە خەرج بكەیت، وەكو لەئایەتێكی تردا دەفەرموێ: (والذين إذا انفقوا لم يسرفوا ولم يقتروا وكان بين ذلك قواما) ﴿[٢٧] ان المبذرين كانوا إخوان الشياطين﴾ بەڕاستی زیادە ڕەوان بوون بە براو هاوكاری شەیتان, لەوەدا كەسامان لەجێی خۆیدا بەخت ناكەن، دیارە ئەوەش گەندەڵییەو كاری شەیتانە، ماڵ و سامان یاسای خەرج كردنیان هەیە، لەو یاسایە لادرا

دەبێتە هەڵە خەرجی و نەزانکاری و، پێویستە دەستی بگیردرێ ﴿وكان الشيطان لربه كفورا﴾ شەیتانیش بۆ پەروەردگاری خۆی زۆر سپلەو ناسوپاسگوزار دەرچوو، ئەو هەموو چەلەحانێ و ململانەیە لەگەڵ پەروەردگاریا کرد ﴿[28] وإما تعرضن عنهم ابتغاء رحمة من ربك ترجوها﴾ وە ئەگەر رووت لەو خزمانە وەرچەرخاندو هیچ نەبوو بەشیان بدەیت و، چاوەنواری رەحمەت و میهرەبانی پەروەردگارت بوویت تا بەڵکو لەئاییندەدا شتێ بدا ﴿فقل لهم قولا میسورا﴾ ئەوە دەکرێ بە وتەیەکی ئاسان و خۆش لەگەڵیان بدوێیت و بڵێی: ئیشە الله هەر خوا گەیاندی بێ بەشت ناکەم ﴿[29] ولا تجعل يدك مغلولة إلى عنقك﴾ وە دەستتەکانت لە گەردنت گرێ مەدە، واتە: لەبەر رەزیلیی و چرووکیی خۆت وەك باڵ بەسراو مەکە، مەبەست ئەوەیە هەر وەکو زنجیر دەستی مرۆڤ دەبەستێ چرووکیش هەروا دەستی مرۆ دەبەستێ لەبەخشش وهاوکاری لێقەوماوان ﴿ولا تبسطها كل البسط﴾ تەواویش دەستەکانت پان مەکەوە تا هەرچیت هەیە بیرێژی بۆ خۆت و بۆ خەڵك ﴿فتقعد ملوما محسورا﴾ ئەوسا ئیتر بە لۆمەکراویی و عەزرەتەوە بۆ خۆت دانیشی، چونکە هیچت لا نەماوە، بەڵێ دەبێ مرۆڤ بزانێ لەگەڵ ماڵ و ساماندا چۆن دەجووڵێتەوە، نابێ هەرچی هەیە ملقی بکاتەوە، ناشبێ چرووك و پیسکەبێت، دەبێ میانە رەوانە بجووڵێتەوە ﴿[30] إن ربك يبسط الرزق لمن يشاء ويقدر﴾ بێگومان پەروەردگارت گەر بیەوێ رزق و رۆزی فراوان دەکاو دەبەخشێت بۆ هەرکەسێ خۆی بیەوێ، یان کەمی دەکا بۆ هەر کەسێك مەیلی لێ بێت ﴿إنه كان بعباده خبيرا بصيرا﴾ چونکە بەڕاستی ئەو (خوا)یە سەبارەت بەبەندەکانی خۆی بەئاگاو بینایە، ئەزانێ کێ بەسامان حاڵی چاك دەبێ و، کێش حاڵی پێ تێك دەچێ و، ڕوو لەفەسادو خراپەکاری دەکات، دەست بلاویی و هەڵە خەرجی کارێکی زۆر ناپەسەندە, هەروەکو چروکیی و دەست نوقاندنیش کاری چنۆك و پیاوە پیسکەکانە، جا لەنێوان هەردووکیان بارێکی ناوەنجی شیاوو پەسەندە، خاتوو (ئەسما) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوەندەو ئەوەندە ببەخشە، واتە: هەمیشە بەخشەربەو قەت لەبەخشین دەست نەگریتەوە، با خوای دلۆڤانیش دەست لە ئێوە نەگرێتەوە، ئەژماری مەکە، با خوایش لەسەرت ئەژماری نەکا. ئەم فەرموودەیەش هەیە: خوایە! هەرکەس دەبەخشێ تۆش پێی ببەخشە، هەرکەسێکیش دەست دەگوشێ، ماڵەکەی بفەوتێنە. (متفق عليه).

**مندالآن مەکوژن:**

عەرەبەکان هەر کە منالیان دەبوو، خێرا لەترسی نەداریی و هەژاریی دەیانکوشت، بەبیانووی هەژاریی! جاخواش بەزەیی بەمندالآندا هاتەوەو فەرمووی: ﴿[31] ولا تقتلوا اولادكم خشية إملاق﴾ زارۆڵەو منالی خۆتان لەترسی هەژاریی مەکوژن ﴿نحن نرزقهم وإياكم﴾ چونکە ئێمەین رزق و رۆزی ئەوان و ئێوەیش دەدەین.

سُورَةُ الإِسۡرَاءِ — الجُزءُ الخَامِسَ عَشَر

وَإِمَّا تُعۡرِضَنَّ عَنۡهُمُ ٱبۡتِغَآءَ رَحۡمَةٖ مِّن رَّبِّكَ تَرۡجُوهَا فَقُل لَّهُمۡ قَوۡلٗا
مَّيۡسُورٗا ٢٨ وَلَا تَجۡعَلۡ يَدَكَ مَغۡلُولَةً إِلَىٰ عُنُقِكَ وَلَا تَبۡسُطۡهَا
كُلَّ ٱلۡبَسۡطِ فَتَقۡعُدَ مَلُومٗا مَّحۡسُورًا ٢٩ إِنَّ رَبَّكَ يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ
لِمَن يَشَآءُ وَيَقۡدِرُۚ إِنَّهُۥ كَانَ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرَۢا بَصِيرٗا ٣٠ وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ
أَوۡلَٰدَكُمۡ خَشۡيَةَ إِمۡلَٰقٖۖ نَّحۡنُ نَرۡزُقُهُمۡ وَإِيَّاكُمۡۚ إِنَّ قَتۡلَهُمۡ كَانَ
خِطۡـٔٗا كَبِيرٗا ٣١ وَلَا تَقۡرَبُواْ ٱلزِّنَىٰٓۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةٗ وَسَآءَ
سَبِيلٗا ٣٢ وَلَا تَقۡتُلُواْ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّۗ وَمَن
قُتِلَ مَظۡلُومٗا فَقَدۡ جَعَلۡنَا لِوَلِيِّهِۦ سُلۡطَٰنٗا فَلَا يُسۡرِف فِّي
ٱلۡقَتۡلِۖ إِنَّهُۥ كَانَ مَنصُورٗا ٣٣ وَلَا تَقۡرَبُواْ مَالَ ٱلۡيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِي
هِيَ أَحۡسَنُ حَتَّىٰ يَبۡلُغَ أَشُدَّهُۥۚ وَأَوۡفُواْ بِٱلۡعَهۡدِۖ إِنَّ ٱلۡعَهۡدَ كَانَ
مَسۡـُٔولٗا ٣٤ وَأَوۡفُواْ ٱلۡكَيۡلَ إِذَا كِلۡتُمۡ وَزِنُواْ بِٱلۡقِسۡطَاسِ ٱلۡمُسۡتَقِيمِۚ
ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلٗا ٣٥ وَلَا تَقۡفُ مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٌۚ
إِنَّ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡبَصَرَ وَٱلۡفُؤَادَ كُلُّ أُوْلَٰٓئِكَ كَانَ عَنۡهُ مَسۡـُٔولٗا ٣٦
وَلَا تَمۡشِ فِي ٱلۡأَرۡضِ مَرَحًاۖ إِنَّكَ لَن تَخۡرِقَ ٱلۡأَرۡضَ وَلَن تَبۡلُغَ
ٱلۡجِبَالَ طُولٗا ٣٧ كُلُّ ذَٰلِكَ كَانَ سَيِّئُهُۥ عِندَ رَبِّكَ مَكۡرُوهٗا ٣٨

٢٨٥

**پشوويەك:** ئەگەر سەرنجێكى ورد لە ڕەوانبێژیى قورئان و وردەكاریەكانى بدەیت، باشتر بڕواى پێدێنى، چونكە هەر بۆ نموونە لەم سوورەتەى (ئیسراء)دا دەفەرموێ: (نحن نرزقهم وإياكم) ڕۆزى منداڵەكان پێش دەخا بەسەر ڕزقى باوكاندا، كەچى لەسوورەتى(ئەنعام)دا ڕزقى باوكان پێش دەخات: (نحن نرزقكم وإياهم) ڕاڤەكەرانى قورئان دەڵێن: حیكمەت لەمەدا خوایش چاكتر دەزانێ ئەوەیە كە لەم سوورەتەدا كوشتنى منداڵەكان لەبەر هەژاریى و لێنەهاتوویانە بۆنان پەیدا كردن، بەڵام لەسوورەتى (ئەنعام)دا كوشتنەكەیان بەبۆنەى هەژاریى باوكانەوەیە.﴿إن قتلهم كان خطأ كبيرا﴾ بەڕاستیى كوشتنى ئەومنداڵانە تاوان و هەڵە كاریەكى زۆر گەورەیە لاى خوا، كاتێ پێغەمبەر ئەوكارە دزێوەى دیت كە بەرامبەر منداڵان دەكرێت فەرمووى: پاش شەریك دانان بۆخوا، تاوانى كوشتنى منداڵان دێت (.. أن تقتل ولدك خشية أن يطعم معك..)) فتح البارى:٨ /١٣.

## لە زیناو شەرواڵپیسى دوور بن:

﴿[٣٢] ولا تقربوا الزنى﴾ وە بەهیچ شێوەیەك توخنى زیناو شەرواڵ پیسى و, ئەوانەیش پێشەكین بۆى، وەك ماچ و مۆچ و قسەو.. مەكەون ﴿إنه كان فاحشة وساء سبيلا﴾ چونكە بەڕاستیى زیناوداوێن پیسى تاوان و كردەوەیەكى زۆر خراپ و، ڕێگایەكى زۆر ناپەسەندە، لاوێكى تازە پێگەیشتوو لەپێغەمبەر ﷺ دەخوازێ مۆڵەتى زیناى بدات! ئینجا خەڵكەكەى دەوروبەرى پێیان ناخۆش بوو ویستیان دەمكوتى بكەن, پێغەمبەر هێورى كردنەوەو فەرمووى بە لاوەكە: ئاوەرە پێش، هاتە پێش و لاى خۆى داینا و فەرمووى: ئەرێ حەز دەكەى خەڵكى لەگەڵ دایك و خۆشك و پورتا زینا بكات؟ لاوەكە گوتى: نەخێر، باب و دایكم لەدەورت گەڕێن، فەرمووى، دەسا خەڵكیش حەزناكا تۆ لەگەڵ كەس وكاریا زینا بكەیت، پاشان دەستى پیرۆزى خستە سەرشانى و فەرمووى: خوایە! لەم لاوەیە خۆشببە، دڵى لەگوناح پاكەوە بكە، عەورەتى لەكارى حەرام بپارێزە، ئیتر لاوەكە بڕاوبڕ بیرى لەو شتانە نەكردەوە.

## خەڵكى بە ناهەق مەكوژن:

﴿[٣٣] ولا تقتلوا النفس التى حرم الله إلا بالحق﴾ وەئەوكەسە خوا خوێنى یاساغ كردووە، بەهەق نەبێ ئێوە مەیكوژن , جا ئەر بەهەق بوو ئەوكاتە قەیدى نییە، بۆنموونە: كەسێك لەئیسلام پاشگەز دەبێتەوە، یان بەدەست ئەنقەست كەسێ بەناهەق دەكوژێ، وەیان كەسێكى (موحصەن) و خاوەن خێزان زینا دەكات..لەم سێ حاڵەتەدا كوشتن بۆ دەوڵەت ڕەوایە، وەكو لە فەرموودەى ڕەواندا هاتووە. ﴿ومن قتل مظلوما فقد جعلنا لوليه سلطانا﴾ بە هەقیقەت ئێمە دەسەڵاتمان بەمیراتگرەكەى داوە كە داوا لە قازى بكات بیكوژێتەوە، یان خوێنى لێوەرگرێ بۆى، یان دەتوانێ ببەخشێ و عەفووى بكا ﴿فلا يسرف فى القتل﴾ جائەو (وەلى)یەش نابێ لە كوشتن و تۆڵەسەندنەوەدا هەڵەرۆیى و زیادەڕەوى بكات, واتە: بۆى نیە كوڕو براو ئامۆزاى یان كەسێكى ترى بكوژەكە بكوژێتەوە لەباتى بكوژ، وە یان جەستەى كوژراوەكە بشێوێنێ و گوێ و لووتى ببڕێ ﴿إنه كان منصورا﴾ چونكە بەڕاستیى ئەو (وەلى)یە سەركەوتووەو كۆمەكى پێكراوە لەلایەن خواوە, ئەوەتە مافى (قیصاص) و تۆڵە وەرگرتنەوەى پێداوە.

## لە ماڵى هەتیودا باش ڕەفتار بكەن:

﴿[٣٤] ولا تقربوا مال اليتيم إلا بالتى هى أحسن﴾ وە لەماڵ و سامانى هەتیو نزیك مەبنەوە، مەگەر بەباشترین شێوە، وەك بۆ پاراستنیى و، هەوڵدان بۆ زیادكردنى لەڕێى بازرگانییەوە ﴿حتى يبلغ اشده﴾ تا پێ دەگاو باڵغ و ئاقڵ دەبێ و دەگاتە هەڕەتى لاویى و, دەشزانێ چۆن سامانى خۆى بپارێزێ، لەئایەتێكدا هاتووەو دەفەرموێ: (ولا تأكلوها إسرافا وبدارا أن يكبروا..). ئیمامى (موسلیم) دەگێڕێتەوە كە: پێغەمبەریش بە(ئەبووزەڕى) فەرموو: تۆ

پیاوێکی ئیدارەت لاوازە، جا لەبەرئەوە هەرگیز سەرپەرستی کاروباری هەتیو نەگریتە دەست: ((..ولاتولین مال الیتیم)) ﴿[٣٥] وأوفوا بالعهد إن العهد كان مسؤلا﴾ و پەیمانیشتان - لەگەڵ خوا، لەگەڵ مەردم - بەرنە سەرێ، چونکە بەڕاستی خاوەن پەیمان لەدواڕۆژدا پرسینەوەی هەیە ﴿[٣٥] وأوفوا الكيل إذا كلتم﴾ هەرکە پێوانەش بۆ خەڵك دەکەن، بەتێرو تەسەلیی ئەنجامی بدەن، خەیانەتیان لێ مەکەن ﴿وزنوا بالقسطاس المستقيم﴾ کێشانەشتان دەبێ بەتەرازووی دادگەرانەو بەرانبەر بێ ﴿ذلك خير واحسن تأويلا﴾ کێشانە و پێوانە بەو شێوەیە چاکترو باشترە لەپاشەڕۆژدا لای پەروەردگارتان. هەموو جاریش (ئیبن عەباس) بە خەڵکەکەی دەگوت: (یامعشر الموالی إنكم ولیتم أمرین بهما هلك الناس قبلكم، هذا المكيال، وهذا الميزان).

**شتێ نەزانی چۆنەو چییە، بەدوایا مەچۆ:**

﴿[٣٦] ولا تقف ما ليس لك به علم﴾ بەدوای شتێکدا مەچۆو نەزانی چیەو چۆنەو, زانیاریت دەربارەی نیە، واتە: تا بەتەواوی زانینت بە شتێ نەبێت، هەنگاوی جیددی بۆ نەنێیت و، قسەی لێ نەکەیت و، بەدووی گومان مەکەوە, ئەم ئایەتەیش کەدەفەرموێ: (.. اجتنبوا كثيرا من الظن إن بعض الظن إثم..) دووپاتی ئەو بنەمایە دەکاتەوە، یان ئەم فەرموودەیە: (..إياكم والظن فإن الظن أكذب الحديث..) ﴿إن السمع والبصر والفؤاد كل اولئك كان عنه مسؤلا﴾ چونکە بەڕاستیی هەموو ئەمانە: (گوێ و چاوو دڵ) هەریەکەیان لەڕۆژی قیامەتدا بەرپرسیارن لێی.

**بەفیزەوە هەنگاو بەسەر زەوییدا مەنێ:**

﴿[٣٧] ولا تمش فی الأرض مرحا﴾ وە بەفیزو خۆ بەزلزانین و کەش و فشێکەوە، وەك لووت بەرزە ستەمکارەکان بەسەر زەوییدا مەچۆ ﴿إنك لن تخرق الأرض﴾ چونکە بەڕاستیی تۆ هەرگیز ناتوانی ئەم زەویە لەت بکەیت و بقڵشێنیت، چونکە تۆ وەکو جەستە، مرۆڤێکی لاوازو بێ دەسەڵاتی, جا ئیتر ئەو خۆ بەزلزانین و کەش و فشەیەت چییە؟ ﴿ولن تبلغ الجبال طولا﴾ قەتیش قەدو باڵات لە درێژیدا ناگاتە درێژی و بەرزی کێوەکان کە بەشێکن لەم زەویە, جا ئیتر ئەو کەشخەیە بۆچییەو، بۆچی سەر دانانوێنیت بۆ پەروەردگاری ئەم بوونەوەرە کەتۆش بەشێکی زۆر بچووکت لێ پێکهێناوە؟ لەفەرموودەیەکدا هاتووە: ((من تواضع لله رفعه فهو فی نفسه حقير وعند الناس كبير، ومن استكبر وضعه الله، فهو فی نفسه كبير وعندالناس حقير، حتى لهو أبغض إليهم من الكلب والخنزير)) ئیبن کەسیر. ﴿[٣٨] كل ذلك كان سيئه عند ربك مكروها﴾ گشت ئەوانە باسکران, ئەو (بیست و پێنج) فەرمان و (نەهیە) بەلای پەروەردگاری تۆوە هەموو ناپەسەندن و، خوا حەزیان پێ ناکات ﴿[٣٩] ذلك مما أوحى إليك ربك من الحكمة﴾ ئەو ڕێنمایی و ئەخلاق و وێڵ و ڕەوشتە بەرزانە کە بۆمان باسکردیت , هەموو بەشێکن لەو وێڵ و یاساو حیکمەتە قەشەنگانەی کە پەروەردگارت بەوەحیی بۆی نیگا کردیت ﴿ولا تجعل مع الله إلها آخر﴾ وە هەرگیز پەرستراوێکی تر لەگەڵ خوا دامەنێ ﴿فتلقى فی جهنم ملوما مدحورا﴾ ئەوسا بە لۆمە کراوەیی و دەرکراوەیی لە ڕەحمەتی خوا، بێ یارو یاوەر توورِ بدرێیتە ناو دۆزەخەوە، بێ ئەوە هیچ کەسێك هەبێت لێت بپرسێتەوە.

**دەڵێن خوا فریشتەی کردووە بە کچی خۆی!:**

﴿[٤٠] افأصفاكم ربكم بالبنين﴾ ئاخۆ کاری وا ڕەوایە کە بەقسەی ئێوەخوای پەروەردگارتان, کوڕانی هەڵبژاردبێ بۆئێوە ﴿واتخذ من الملائكة إناثا﴾ وفریشتەکانیشی بەمێینە بۆ خۆی هەڵبژاردبێ؟! ﴿إنكم لتقولون قولا عظيما﴾ بەڕاستیی ئێوە قسەیەکی زۆر زلو گەورەو ناقۆڵا دەکەن بەرامبەر بەخوا، دیارە ئەمە ڕەتی ئەوانەیە کە دەیانگوت: فریشتە کچی خوان!. لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: (وقالوا اتخذ الرحمن ولدا لقد جئتم شيئا إدا تكاد السموات

یتفطرن منه وتنشق الأرض وتخر الجبال هدا أن دعوا للرحمن ولدا..) ﴿[41] ولقد صرفنا فی هذا القرآن لیذكروا﴾
بێگومان ئێمە لەم قورئانەدا هەموو جۆرە پەندو ئامۆژگاریی و پێداویستییەكمان شیكردۆتەوە بۆ مرۆڤ , تا پەند وەرگرن و بیربكەنەوەو بڕوا بهێنن بەیەكتاكیی خوا ﴿وما یزیدهم إلا نفورا﴾ كەچی خوانەناسان تابێت هەر دوور دەكەونەوەو دوورەپەرێز دەبن ﴿[42] قل لو كان معه آلهة كما یقولون﴾ ئەی پێغەمبەر! بەوانە بڵێ كە شەریك بۆ خوا دادەنێن: گریمان ئەر لەگەڵ خوادا چەند خوایەك هەبوبا وەكو ئەوان دەڵێن ﴿إذالابتغوا إلى ذی العرش سبیلا﴾ ئەوسا هە ریەك لەو خوایانە هەوڵی دەدا كە ڕێگەیەك بۆلای خوای خاوەن عەرش بگرێتە بەر،هە تا زاڵ بێن بەسەریا , هەروەكو دەسەڵاتدارانی دنیا كە دەبینی دوو پاشا پێكەوە نایانكرێ و، هەوڵی لەناو بردنی یەكتر دەدەن، ئێستا كەئەوە نییە،مانای وایە تەنها خوایەكیتاك و تەنیا هەیە ﴿[43] سبحانه وتعالى عما یقولون علوا كبیرا﴾ پاك و خاوێنی و، بەرزو بڵندی بۆ خوا، سەبارەت بەو قسانەئەو نەفامانە دەیانڵێن بەرامبەر بەو، ئەو خوایە تاك و تەنیایەو، بێ هاوەڵ و بێشەریكە، بێ ژن و بێ منداڵ و بێ هاوسەرە.

**هەموو بوونەوەر پاكانە بۆ خوا دەكا:**

﴿[44] تسبح لە السموات السبع والأرض ومن فیهن﴾ هەرحەوت ئاسمانەكان و زەویی و،هەموو ئەوانەش كە تێیاندان، هەموو گەورەیی و بێ خەوشی ئەو (خوا)یە دەڵێن, گەواهیی بۆ یەكتایی ئەو دەدەن، وەكو شاعیرێك دەڵێت:

ففی كل شئ لە آیة    تدل على أنە واحد

﴿وإن من شئ إلا یسبح بحمده﴾ هەموو شتێك هەرهاواری تاك و تەنیایی ئەو ئەكەن" پاڕانەوەو تەسبیحات و حەمدی ئەو دەڵێن، واتە: هەموونیازمەندی ئەون، ئەو بێنیازە لە هەموو ﴿ولكن لا تفقهون تسبیحهم﴾ بەڵام ئێوە لەپاكانەو تەسبیحاتیان تێناگەن چونكە عەقڵ و ژیریتان ناخەنە كار بۆ تێگەیشتن.(ئەنەس) دەڵێت: پێغەمبەر چووە ناو هۆزێكەوە، دیتی لە سەر پشتی ولاخەكانەوەن و سواربوون ورازی قسە یان دامەزراندووە، ئەویش فەرمووی: (إركبوها سالمة ودعوها سالمة،ولا تتخذوها كراسی لأحادیثكم فیالطرق والأسواق، فرب مركوبة خیر من راكبها،وأكثر ذكرا لله منه)) پێشەوا ئەحمەد. ﴿إنە كان حلیما غفورا﴾ بەڕاستیی ئەو (خوا)یەهەمیشە بەحەوسەڵەو لەسەر خۆیە، بۆیە لە گەڵ ئەوهەموو گوناح و تاوانەدا مۆڵەتی ئێوە دەدا و ناتانگرێ , زۆریش لێبووردەیە، بۆیە هەركەسێك داوای لێبوردنی لێبكات, لێیدەبووری.

الجزء الخامس عشر — سورة الإسراء

ذَٰلِكَ مِمَّآ أَوۡحَىٰٓ إِلَيۡكَ رَبُّكَ مِنَ ٱلۡحِكۡمَةِۗ وَلَا تَجۡعَلۡ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا
ءَاخَرَ فَتُلۡقَىٰ فِي جَهَنَّمَ مَلُومٗا مَّدۡحُورًا ٣٩ أَفَأَصۡفَىٰكُمۡ رَبُّكُم
بِٱلۡبَنِينَ وَٱتَّخَذَ مِنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِنَٰثًاۚ إِنَّكُمۡ لَتَقُولُونَ قَوۡلًا عَظِيمٗا ٤٠
وَلَقَدۡ صَرَّفۡنَا فِي هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ لِيَذَّكَّرُواْ وَمَا يَزِيدُهُمۡ إِلَّا نُفُورٗا ٤١
قُل لَّوۡ كَانَ مَعَهُۥٓ ءَالِهَةٞ كَمَا يَقُولُونَ إِذٗا لَّٱبۡتَغَوۡاْ إِلَىٰ ذِي ٱلۡعَرۡشِ سَبِيلٗا
٤٢ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَقُولُونَ عُلُوّٗا كَبِيرٗا ٤٣ تُسَبِّحُ لَهُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ
ٱلسَّبۡعُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهِنَّۚ وَإِن مِّن شَيۡءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمۡدِهِۦ وَلَٰكِن
لَّا تَفۡقَهُونَ تَسۡبِيحَهُمۡۚ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورٗا ٤٤ وَإِذَا قَرَأۡتَ
ٱلۡقُرۡءَانَ جَعَلۡنَا بَيۡنَكَ وَبَيۡنَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ حِجَابٗا
مَّسۡتُورٗا ٤٥ وَجَعَلۡنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ أَكِنَّةً أَن يَفۡقَهُوهُ وَفِيٓ ءَاذَانِهِمۡ
وَقۡرٗاۚ وَإِذَا ذَكَرۡتَ رَبَّكَ فِي ٱلۡقُرۡءَانِ وَحۡدَهُۥ وَلَّوۡاْ عَلَىٰٓ أَدۡبَٰرِهِمۡ نُفُورٗا
٤٦ نَّحۡنُ أَعۡلَمُ بِمَا يَسۡتَمِعُونَ بِهِۦٓ إِذۡ يَسۡتَمِعُونَ إِلَيۡكَ وَإِذۡ هُمۡ نَجۡوَىٰٓ
إِذۡ يَقُولُ ٱلظَّٰلِمُونَ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا رَجُلٗا مَّسۡحُورًا ٤٧ ٱنظُرۡ
كَيۡفَ ضَرَبُواْ لَكَ ٱلۡأَمۡثَالَ فَضَلُّواْ فَلَا يَسۡتَطِيعُونَ سَبِيلٗا ٤٨
وَقَالُوٓاْ أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمٗا وَرُفَٰتًا أَءِنَّا لَمَبۡعُوثُونَ خَلۡقٗا جَدِيدٗا ٤٩

قل كونوا — ٢٨٦

**پەردە دەخەینە سەر دڵی موشریكان با قورئان وەر نەگرن:**

(ئیبن هیشام) دەڵێ: پاش هاتنی سوورەتی (تبت یدا..) خێزانەكەی (ئەبولەهەب) زۆر بە توورەیی و ئاڵۆزیەكەوە بەرەو پێغەمبەر هات، (ئەبوبەكر)یش ترسی لێنیشت كە پێغەمبەر ﷺ ببینێ و،ئازاری بدات،

پێغەمبەریش فەرمووی: ئەو قەت من نابینیٚ هەتا بتوانیٚ ئازارم بدات, ئەوجا هەندیٚ قورئانی بەدەور خۆیدا خوێند، پاشان ئەم ئایەتە هات و فەرمووی: ﴿ ٤٥ وإذا قرات القرآن جعلنا بينك وبين الذين لا يؤمنون بالآخرة حجابا مستورا﴾ هەرکە تۆ قورئانیان بەسەرا دەخوێنی -لە بەرلاساریی و نەگریسیی خۆیان- ئێمە لەنێوان تۆو ئەوانەدا کە باوەڕیان بەپاشە ڕۆژ نیە،پەردەیەکی نادیارو داپۆشراو دادەنێین ﴿ ٤٦ وجعلنا على قلوبهم اكنة ان يفقهوه﴾ وچەند سەرپۆشێك لەبان دڵیان دادەنێین تا لێی تێنەگەن. ﴿ ٤٦ وفى آذانهم وقرا﴾ و قورسیی و گرانی دەخەینە گوێیانەوە, تا هەق نەبیسن، چونکە خۆیان نایانەویٚ ببیسن،خواش بە زۆر پێیان نابیسیٚ. ﴿وإذا ذكرت ربك فى القرآن وحده﴾ وەهەرکات لەم قورئانەدا بەتەنها ناوی پەروەردگارت دێنیت. واتە: کە باسی (لات) و (هوبەل..) ناکەیت و,هەر بەتەنها دەڵێیت (لا إله إلا الله) ﴿ولوا على أدبارهم نفورا﴾ هاوبەشدانەرەکان بەقینەوە پشت هەڵدەکەن و، هەڵدێن و بێزاری خۆیان دەردەبڕن تا نەیبیسن!

**ئاگامان لە سرتە سرتی قورەیشە:**

﴿ ٤٧ نحن أعلم بما يستمعون به﴾ ئێمە لە هەموو کەس چاکتر دەزانین کە خوا نەناسەکان بە چ نیازیٚ گویٚ بۆ قورئان دەگرن ﴿إذ يستمعون إليك وإذهم نجوى﴾ کاتیٚ گوێت بۆ دەگرن و، ئەوکاتەش کە دەکەونە چرپە چرپ و سرتە سرت، واتە: ئاگامان لێیانە کەچۆن لاقرتیی و گاڵتە دەکەن ودەڵێن: جادووبازە، یان دەڵێن جادووی لێکراوە! وەکو دەفەرمویٚ: ﴿إذ يقول الظالمون إن تتبعون إلا رجلا مسحورا﴾ ئەودەمەی کە ستەمکارەکان لەناو یەکتردا دەڵێن: ئێوە هەر لەپیاوێکی جادوو لێکراو پەیڕەوی دەکەن, دیارە سەر زەنشتی یەکتر دەکەن بۆ ئەوەخەڵکەکەی لیٚ هەڵبنێن و، قورسایی کەم بکەنەوەو ناوی بنێن جادوو لێکراو ﴿ ٤٨ انظر كيف ضربوا لك الأمثال فضلوا﴾ دەسابڕوانە چۆن نموونەی جۆراوجۆرت بۆ دەهێننەوە بەوەش سەریان لە خۆیان تێکدا، بۆیە جاریٚ دەڵێن شێتە، جارێکیتر دەڵێن جادووی لێکراوە.. گومڕایە، ساحیرە، شاعیرە!! ﴿فلا يستطيعون سبيلا﴾ ئینجا ناتوانن ڕێگەیەك بۆ هیدایەت بدۆزنەوە.

**دەڵێن کە بووینە ئێسك و پروسك چۆن زیندوو دەبینەوە؟!**

﴿ ٤٩ وقالوا إذا كنا عظاما ورفاتا﴾ ئەوانەی باوەڕیان بەزیندوو بوونەوە نەبوو بەسەر سوڕمانێکەوە گوتیان: ئایا کاتیٚ ئێمە بووینە ئێسکەڕزیوو پارچەپارچە بووین و پواین لەگۆڕدا ﴿إنا لمبعوثون خلقا جديدا﴾ ئاخۆ سەر لەنویٚ زیندوو دەکرێینەوەو دروست دەبینەوە؟ لەجێگایەکی تردا دەفەرمویٚ: (يقولون إنا لمردودون فى الحافره.إذا كنا عظاما نخرة.قالوا تلك إذا كرة خاسرة) ﴿ ٥٠ قل كونوا حجارة أو حديدا﴾ پێیان بڵیٚ: حەز دەکەن ببنە بەرد، یان ئاسن- کە هەردوو بەرەواڵەت لەژیاننەوە دوورن- ئەوکاتەش هەرخوا زیندووتان دەکاتەوە, چونکە خوای گەورە هیچیلەدەست دەرناچێت ﴿ ٥١ أو خلقا مما يكبر فى صدوركم﴾ یان ببنە شتێك ودورستکراوێکی تر کە لەخەیاڵی ئێوەدا زۆر سەخت و زۆر گەورەبێت، وەك ئاسمان و زەویی.. واتە: ببنە هەرشتیٚ خوا هەردەتانمرێنیٚ و زیندووتان دەکاتەوەو تۆڵەتان لێدەسێنێت ﴿فسيقولون من يعيدنا﴾ بەسەرسامییەوە دەڵێن: دەباشە! کەئێمە بووینە بەردو ئاسن، کیٚدەتوانیٚ جارێکیتر بمانگێڕێتەوە بۆ ژیان و زیندوومان کاتەوە؟ ﴿قل الذى فطركم أول مرة﴾ بڵیٚ: هەر ئەوزاتەی کەیەکەمجار ئێوەی بەدیهێنا بیٚ بناغە, هەر ئەوەش زیندووتان دەکاتەوە. وە لەجێگایەکی دیکەدا هەر لەو بارەوە دەفەرمویٚ: (وهوالذى يبدأ الخلق ثم يعيده وهو أهون عليه..)، ﴿فسينغضون إليك رؤسهم ويقولون متى هو﴾ ئەوسا لەڕووی ئینکارییەوە دەست دەکەنە سەرەلەقیٚو دەڵێن: باشە ئەو زیندوو بوونەوەیە کەی دەبێت؟!یان دەڵێن:

(متى هذا الوعد إن كنتم صادقين) ﴿قل عسى أن يكون قريبا﴾ پێیان بڵێ: لەوانەیە هاتنی نزیك بێت، دیارە هەر شتێكیش لەهاتندا بێت، نزیكەو هەرپێشدێت ﴿٥٢ يوم يدعوكم فتستجيبون بحمده﴾ رۆژێ كە خوای گەورە بانگتان لێدەكات بۆ زیندوو بوونەوە" ئێوەیش بەدەم سوپاسەوە دەست بەجێ وەڵامی ئەدەنەوەو زیندوودەبنەوەو ناتوانن دوابكەون ﴿وتظنون إن لبثتم إلا قليلا﴾ و واگومان دەبەن كە لەدنیادا تەنهاكاتێكی زۆر كەم ماونەتەوەو ژیاون.

**چ وشەیە جوانترو باشترە بەوە گۆ بكەن:**

﴿٥٣ وقل لعبادى يقولوا التى هى احسن﴾ ئەی پێغەمبەر! ﷺ بە بەندەكانم بڵێ: بەوشەیەك گۆ بكەن باشترو جوانتربێ‌بۆ راگرتنی سۆزی خۆشەویستیی نێوانیان، واتە:هەوڵ بدەن چ قسەوكارو كرداری باشترە، ئەوە بكەن وئەوە بڵێن، هەر شتێك دەبێتە هۆی بچڕانی خۆشەویستیی، دووریی لێبگرن، بۆیە پێغەمبەر ﷺ بەم فەرموودەیە رێدەگرێت لەوە كە لوولەی تەفەنگ ئەگەر خاڵیش بێت بكرێتە هەرموسڵمانێك: ((لايشيرن أحدكم إلى أخيه بالسلاح، فإنه لايدرى أحدكم لعل الشيطان أن ينزع فى يده فيقع فى حفرة من النار)) پێشەوا ئەحمەد. ﴿إن الشيطان ينزغ بينهم﴾ چونكە شەیتان هەمیشە دەیەوێ فیتنەو ئاژاوە لەنێوانیاندا ساز بكا, جا ئەگەرئێوەش زیرەك وهۆشیارنەبن، ئەوا دەتوانێت بە شتێكی بچكۆڵەش بێت نێوانتان تێك بدات! ﴿إن الشيطان كان للإنسان عدوا مبينا﴾ بێگومان شەیتان بۆ مرۆڤ هەمیشە دوژمنێكی ئاشكرایەو،هەر لەمەڵاسدایە بۆیان ﴿٥٤ ربكم أعلم بكم﴾ پەروەردگارتان لەخۆتان چاكتر دەتانناسێ‌و, چاكتر دەزانێ شیاوی چ شتێك بن ﴿إن يشأ يرحمكم﴾ بۆیە ئەگەر بیەوێ رەحمتان پێدەكاو, بەرەورێبازی هیدایەت دەتانبات ﴿أو إن يشأ يعذبكم﴾ خۆ ئەگەر حەزیش بكات سزاتان بدات , كاتێ رێبازی خراپ بگرنەبەر، ئەوا سزاتان دەدات، كەوابووئەو خۆی باشتر دەتانناسێت ﴿وما ارسلناك عليهم وكيلا﴾ و تۆشمان بەوەكیل و بەرپرسیار لەكاری ئەوان نەناردووە، تاناچاریان بكەیت باوەڕ بێنن، بەڵكو تۆ ترسێنەرو مژدەبەخشیت، كێ‌بەگوێی‌كردیت، دەچێتە بەهەشتەوە، كێیش سەر پێچی كرد،جێگای دۆزەخە ﴿٥٥ وربك اعلم بمن فى السموات والأرض﴾ و هەرپەروەردگارت لەحاڵی هەموو ئەوانەی لەئاسمانەكان و زەوییدان زاناترو بەئاگاترە كە خەریكی چین وچ هەڵدەگرن ﴿ولقد فضلنا بعض النبيين على بعض﴾ بێگومان لەناو پێغەمبەرەكانیشدا هەندێكیانمان لەهەندێكی تریان بەرزتر گرت , وەكو لەئایەتێكی تردا دەفەرموێ: (تلك الرسل فضلنا بعضهم على بعض منهم من كلم الله ورفع بعضهم درجات) ﴿وآتينا داود زبورا﴾ وە كتێبی زەبووریشمان بە(داود) دا,كەواتە بۆچی‌نكووڵی قورئان دەكەن ئەی بەنی ئیسرائیل!.

الجزء الخامس عشر سورة الإسراء

قُلْ كُونُوا حِجَارَةً أَوْ حَدِيدًا ﴿٥٠﴾ أَوْ خَلْقًا مِمَّا يَكْبُرُ فِي صُدُورِكُمْ فَسَيَقُولُونَ مَنْ يُعِيدُنَا قُلِ الَّذِي فَطَرَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ فَسَيُنْغِضُونَ إِلَيْكَ رُءُوسَهُمْ وَيَقُولُونَ مَتَى هُوَ قُلْ عَسَى أَنْ يَكُونَ قَرِيبًا ﴿٥١﴾ يَوْمَ يَدْعُوكُمْ فَتَسْتَجِيبُونَ بِحَمْدِهِ وَتَظُنُّونَ إِنْ لَبِثْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٥٢﴾ وَقُلْ لِعِبَادِي يَقُولُوا الَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِنَّ الشَّيْطَانَ يَنْزَغُ بَيْنَهُمْ إِنَّ الشَّيْطَانَ كَانَ لِلْإِنْسَانِ عَدُوًّا مُبِينًا ﴿٥٣﴾ رَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِكُمْ إِنْ يَشَأْ يَرْحَمْكُمْ أَوْ إِنْ يَشَأْ يُعَذِّبْكُمْ وَمَا أَرْسَلْنَاكَ عَلَيْهِمْ وَكِيلًا ﴿٥٤﴾ وَرَبُّكَ أَعْلَمُ بِمَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلَقَدْ فَضَّلْنَا بَعْضَ النَّبِيِّينَ عَلَى بَعْضٍ وَآتَيْنَا دَاوُودَ زَبُورًا ﴿٥٥﴾ قُلِ ادْعُوا الَّذِينَ زَعَمْتُمْ مِنْ دُونِهِ فَلَا يَمْلِكُونَ كَشْفَ الضُّرِّ عَنْكُمْ وَلَا تَحْوِيلًا ﴿٥٦﴾ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ يَدْعُونَ يَبْتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ الْوَسِيلَةَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ وَيَرْجُونَ رَحْمَتَهُ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحْذُورًا ﴿٥٧﴾ وَإِنْ مِنْ قَرْيَةٍ إِلَّا نَحْنُ مُهْلِكُوهَا قَبْلَ يَوْمِ الْقِيَامَةِ أَوْ مُعَذِّبُوهَا عَذَابًا شَدِيدًا كَانَ ذَٰلِكَ فِي الْكِتَابِ مَسْطُورًا ﴿٥٨﴾

٢٨٧

**پەرستراوەکان بەجێی خوا ناتەوانان:**

﴿ ٥٦ **قل ادعوا الذين زعمتم من دونه**﴾ ئەی پێغەمبەر! ﷺ بەبێ باوەڕان بڵێ: ئادەی هانا بەرنە بەرئەوانەی وا لەباتیخوا دەتانپەرستن، ئایا زیان وبەڵایەکتان لە سەرلادەبن؟ ﴿**فلا يملكون كشف الضر عنكم ولا تحويلا**﴾ دڵنیابن کە نەدەسەڵاتیلابردنی خۆشیی و زیانیان هەیە لێتان ،وە نەدەسەڵاتی ئاڵ وگۆڕی بارودۆخیان هەیە، واتە: تەنها خوایە ئەوکارانەی لێدێت ﴿ ٥٧ **أولئك الذين يدعون يبتغون إلى ربهم الوسيلة أيهم اقرب**﴾ ئەوانەی ئەوان دەیانپەرستن و هاناوهاواریان بۆ دەبەن، بۆنموونە: (جوولەکە بۆ عوزەیر، گاور بۆ عیسا، موشریکەکان بۆ فریشتە) خۆیشیان هەتا بەخواوە نزیکتربن، هێشتاهەر لەهۆیەك دەگەڕێن کە خۆیانی زیاتر لە پەروەردگار پێ نزیك بکەنەوە، ئیتر ئێوە چۆن ئەوانە دەپەرستن؟! ﴿**ويرجون رحمته**﴾ بەئومێدی رەحمەت و میهرەبانی ئەو (پەروەردگار)ەن ﴿**ويخافون عذابه**﴾ و لەتۆڵەو سزایشی دەترسن، بەڵێ خوا پەرستیی دەبێ لەنێوان هیواو ترسدا بێت ﴿**إن عذاب ربك كان محذورا**﴾ بەڕاستیی سزای پەروەردگاری تۆ وەها سەختە، دەبێ هەموو کەسێك خۆی لێ بپارێزێ.

**بەر لە هاتنی قیامەت ئاوەدانی نامێنێ:**

﴿ ٥٨ **وإن من قرية إلا نحن مهلكوها قبل يوم القيامة**﴾ بەڕاستیی پێش هاتنی رۆژی قیامەت هەرچی شارو گوندێك هەبێت ئێمە تێکی دەدەین و وێرانی دەکەین ، ئەگەر چاك بێ بەمردنی دانیشتووەکانی ﴿**أو معذبوها عذابا شديدا**﴾ یان لەدنیادا پێش هاتنی قیامەت سزایەکی سەختیان دەدەین، بەجنگ ئەگەر پیاو خراپ و لاسار بن، لەئایەتێکدا دەفەرموێ: (وما ظلمناهم ولكن أنفسهم يظلمون) یان دەفەرموێ: (وكأين من قرية عتت عن امر ربها ورسله..) ﴿**كان ذلك فى الكتاب مسطورا**﴾ بڕیاری وا لەدۆسیەی (لوح المحفوظ) دا نوسراوەو بڕاوەتەوەو ناگۆڕێ.

الجزء الخامس عشر — سورة الإسراء

وَمَا مَنَعَنَآ أَن نُّرْسِلَ بِٱلْـَٔايَـٰتِ إِلَّآ أَن كَذَّبَ بِهَا ٱلْأَوَّلُونَ ۚ وَءَاتَيْنَا ثَمُودَ ٱلنَّاقَةَ مُبْصِرَةً فَظَلَمُوا۟ بِهَا ۚ وَمَا نُرْسِلُ بِٱلْـَٔايَـٰتِ إِلَّا تَخْوِيفًا ﴿٥٩﴾ وَإِذْ قُلْنَا لَكَ إِنَّ رَبَّكَ أَحَاطَ بِٱلنَّاسِ ۚ وَمَا جَعَلْنَا ٱلرُّءْيَا ٱلَّتِىٓ أَرَيْنَـٰكَ إِلَّا فِتْنَةً لِّلنَّاسِ وَٱلشَّجَرَةَ ٱلْمَلْعُونَةَ فِى ٱلْقُرْءَانِ ۚ وَنُخَوِّفُهُمْ فَمَا يَزِيدُهُمْ إِلَّا طُغْيَـٰنًا كَبِيرًا ﴿٦٠﴾ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِـَٔادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ قَالَ ءَأَسْجُدُ لِمَنْ خَلَقْتَ طِينًا ﴿٦١﴾ قَالَ أَرَءَيْتَكَ هَـٰذَا ٱلَّذِى كَرَّمْتَ عَلَىَّ لَئِنْ أَخَّرْتَنِ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ لَأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٦٢﴾ قَالَ ٱذْهَبْ فَمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ فَإِنَّ جَهَنَّمَ جَزَآؤُكُمْ جَزَآءً مَّوْفُورًا ﴿٦٣﴾ وَٱسْتَفْزِزْ مَنِ ٱسْتَطَعْتَ مِنْهُم بِصَوْتِكَ وَأَجْلِبْ عَلَيْهِم بِخَيْلِكَ وَرَجِلِكَ وَشَارِكْهُمْ فِى ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَوْلَـٰدِ وَعِدْهُمْ ۚ وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيْطَـٰنُ إِلَّا غُرُورًا ﴿٦٤﴾ إِنَّ عِبَادِى لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَـٰنٌ ۚ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ وَكِيلًا ﴿٦٥﴾ رَّبُّكُمُ ٱلَّذِى يُزْجِى لَكُمُ ٱلْفُلْكَ فِى ٱلْبَحْرِ لِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ﴿٦٦﴾

٢٨٨ — وَإِذَا مَسَّكُمُ

**هۆی نەناردنی نیشانەکان؟**

﴿ ٥٩ **وما منعنا أن نرسل بالآيات إلا أن كذب بها الأولون**﴾ هیچ شتێك رێی لەئێمە نەگرتووە کە موعجیزەو نیشانەی گرنگ بنێرین و نیشانی قورەیشی بدەین لە سەرداوای خۆیان، ئەوە نەبێ کە بەرلەمان موعجیزەیەکی زۆرمان نیشانی پێشینانیاندا کەچی بڕوایان نەهێنا و بەدرۆیان خستنەوەو، ئەوجا بەر قارو سزامان کەوتن و، لەناومان بردن، ئێستاش کە قورەیش داوای موعجیزە دەکەن و نایاندەینێ، هەر لەبەر ئەوەیە نەوەك ئەمانیش بڕوا نەهێنن، ئەوجا ئێمەیش بەپێی یاسای خۆمان لەناویان بەرین ﴿**وآتينا ثمود الناقة مبصرة فظلموا بها**﴾ ئێمە وشترەکەمان بەئاشکراوبە ڕوونی لەسەر داوای خۆیان بەهۆزەکەی (سەموود)دا، کەچی ستەمیان لێکردو پەلیانکردو کوشتیان، ئەو جا ئێمەیش سزاماندان و لەناو چوون ﴿**وما نرسل بالآيات إلا تخويفا**﴾ وەئێمە هەر بۆ ترس

وەبەرنانە کە:جۆراوجۆر ئایەت و موعجیزە دەنێرین، وەك زەمین لەرزەو خۆرگیران و مانگگیران، بۆ ئەوەیە بیریّ بکەنەوەو دابچڵەکێن، لە سەر دەمی(عەبدو اللە)ی(ئیبن مەسعوود)دا (کووفە) بوومە لەرزەیەك لێیدا، گوتی: خەڵکینە! خوا گلەییتان لێدەکات, بۆیە ئەم بوومە لەرزەیە ناوچەکەی گرتنەوە، دەسا گلەییەکانی خوا مەهێڵن ورووبکەنەوەلێی، جاکاتێکیش خۆر گیرا ((پێغەمبەرﷺ بەخەڵکەکەی گوت:ئەم مانگ وخۆرە دووبەڵگەن لەسەر بوونیخوای گەورە،بۆ لەدایکبوون ومردنیهیچ کەسێك ئاوا نابن، بەڵکو خوای بالآدەست دەیەویّ بەو ئاوابوونەیە بەندەکانی خۆی بترسێنیّ،جاهەر کاتیّ ئێوە دیتانن گیران و ئاوابوون، خێرا پەلامار بدەنە زیکرو دوّعاو، داوای لێبوردن لە خوا بکەن..)) فتح الباری:٢/٦١٥.

**پەروەردگار دەورەی لە مەردم داوە:**

﴿٦٠ وإذ قلنا لك إن ربك احاط بالناس﴾ ئەودەمە وەبیربێنە کە پێمانگوتی:بەڕاستیی پەروەردگاری تۆ ئەی پێغەمبەر! ﷺ دەورەی لەمەردم داوەو دەسەڵاتی تەواوی بەسەریاندا هەیەو دەتپارێزی لێیان ﴿وماجعلنا الرؤيا التی أریناك إلا فتنة للناس﴾ و ئەو شتانەش لە شەو ڕەوییەکەدا نیشانمان دایت و بەچاودیتن، هەر بۆ تاقیکردنەوەی خەڵکیبوو: ئاخۆ کیّ بڕوا دێنیّو دەترسیّ، کێش بڕوا ناهێنیّ و ناترسیّ؟ پێشەوا (بوخاریی) لە (ئیبن عەبباس)ەوە دەڵێت: (هی رؤیا عین أریها رسول اللە ﷺ لیلة أسری به). واتە: ئەم (رؤیا)یە لێرەدا مانای دیتنی چاوە، نەك دیتن لە خەودا ﴿والشجرة الملعونة فی القرآن﴾ ودرەختە نەفرین لێکراوەکەش کەلە قورئاندا بە (شجرة الزقوم) هاتووەو بۆتە گاڵتە جاڕی کافران, ئەویش هەر بۆ تاقیکردنەوەی خەڵکە, ئەوە بوو کاتیّ باستکرد بۆیان، دەستیان کردە گاڵتەو گەپ و وتیان: ئاگر درەخت دەسووتێنیّ, چۆن چۆنیّ لەناو ئاگردا دەڕویّ؟ دەرەنجام نەفرینیان لێکرا.

ڕووداوی (شەورەویی)و دیتنی ئەو هەمووعەجایباتە لەتەنها ساتێکداو، سەوز بوونیئەو درەختە لەنێو ئاگری دۆزەخ دا هەردوو تاقییکردنەوەن بۆ خەڵك! جاخوای گەورە سەبارەت بەو درەختە دەفەرمویّ: (إنها شجرة تخرج فی أصل الجحيم) یان دەفەرمویّ: (أذلك خير نزلا أم شجرة الزقوم إنا جعلناها فتنة للظالمين). ﴿ونخوفهم فما يزيدهم إلا طغيانا كبيرا﴾ ئێمە ئەوکافرانە بەجۆرەها ئایەت و نیشانە دەترسێنین، کەچیپتر خەریکی سەرکەشی خۆیان دەبن!!

**سەرگورشتەی ئادەم و ئیبلیس:**

﴿٦١ وإذ قلنا للملائكة اسجدوا لآدم﴾ وئەوکاتەیان وەبیر بێنەوە ئەی پەیامبەر! ﷺ کەبە فریشتەکانمان گوت: کڕنوش بۆ ئادەم بەرن , کڕنوشی ڕێزو حورمەت ﴿فسجدوا إلا إبليس﴾ جائەوانیش دەست بەجیّ گشت کڕنووشیان برد، ئیبلیس نەبیّ ﴿قال أأسجد لمن خلقت طينا﴾ لەبەر ئێرەیی و حەسوودیی خۆی وتی: من چۆن کڕنوش دەبەمە بەر کەسێك کە لەقوڕ دروستتکردووە؟ من بەرزو بەڕێزم، ئەو خوارو پەستە! ﴿٦٢ قال أرأيتك هذا الذی كرمت علی﴾ هەمیسان وتی: ئاخر پێم ناڵێیت: ئەمە چییە تۆ ڕێزت بەسەرمندا داوە؟ ئاخۆ چ جەوهەرێکی بەسەرمدا زیادە؟! ﴿لئن أخرتنی إلی يوم القيامة﴾ ئەرتا ڕۆژی قیامەت بە زیندوویی بمهێڵیت ﴿لأحتنكن ذريته إلا قليلا﴾ مەرج بێت زاروّ نەوەکانی -کەمێکیان نەبیّ- هەموو گومڕاو لاریّ بکەم ﴿٦٣ قال اذهب فمن تبعك منهم﴾ خوا فەرمووی:دەسابچۆ مۆڵەتت بێت، هەرچی دەتوانی بەکاری بێنە، ئەو جاهەرکەسێکیان پەیڕەوی لە تۆبکا ﴿فإن جهنم جزاؤكم جزاء موفورا﴾ جائەوە بەڕاستیی سزای هەمووتان پڕ بەپڕ دۆزەخ دەبێت ﴿٦٤ واستفزز من استطعت

مـنهم بصـوتك﴾ وهەرکەسێکیان تـۆ پێـی دەوێریـت بـانگی بکـەو، بـەدەنگ و سـەدای ناهـەقیی خـۆت بیخرۆشێنه ولەهەقیی وە دوورخە، هەتا دەیخەڵەتێنێ و فریوی دەدەیت.

(شەنقیطیی) لە(أضواء البیان)دا لە تەفسیری(بصوتك) دا دەڵێ: (مجاهد بۆ تەفسیری: (بصوتك) دەڵێ:(أی باللهو والغناء والمزامیر , وقیل: أی بوسوستك) واتە: بەگۆرانیی وگاڵتە وگەپ وبە هەموو ئاوازودەنگێکی مۆسیقا مرۆڤەکان بخرۆشێنەو بیانخەڵەتێنە , یان بە وەسوەسەو دەغدەغە.(ئیبن عەباس)یش دەڵێ: (صوته یشمل کل داع دعا الی معصیة) واتە:دەنگ وئاوازی شەیتان هەموو کارو کردەوەیەکی تاوان وحەرام دەگرێتەوە. ﴿واجلب علیهم بخیلك ورجلك﴾ وەبەگشت لەشکرو هێزی سوارەو پیادەی خۆتەوە دنەیان بدەو هێرشیان بۆبەرە ﴿وشارکهم فی الأموال والأولاد﴾ و ببە هاوبەش لە ماڵو منداڵیاندا. واتە: لە ڕێگەی حەرام و یاساغەوە ماڵیان پێ پەیدا بکەو هەر لەو ڕییەشدا پییان دابنێ ﴿وعدهم﴾ وئەوەندەش بەڵێنیان بدەرێ و سەرگەرمیان بکە بە درۆکانی خۆتەوە وەکو ئەوە: قیامەت بەرپانابێ، حیساب و کیتاب نابێ......! ﴿وما یعدهم الشیطان إلاغرورا﴾ هەرچی بەڵێنی شەیتانە, تـەنها چەواشـە گـەریی و فریودانـە، بـەکورتیی:خـوای گـەورە دەفـەرموێ: بـە هەرشـێوەیەك دەتـوانی بچـۆ هـەڵیان خەڵەتێنـە. پێشـەوا (موسلیم) ئـەم مەرموودەیـە هێنـاوە: ((یقول الله عزوجل: إنی خلقت عبادی حنفاء، فجاءتهم الشیاطین فاجتالتهم عن دینهم،وحرمت علیهم ماأحللت لهم)) ﴿٦٥ إن عبادی لیس لك علیهم سلطان﴾ بێگومانبە تۆ هیچ دەسەڵات و توانایەکت بەسەربەندە ڕاستەاکانی مندا نابێت، واتە: هـەرگیز نـاتوانی فریویـان بـدەیت چونکە خوایـان لەپشـتە. (ئیبن عـەباس) دەڵێ:مەبەسـت بەوبەندانـە کـە شـەیتان پێیـان نـاوێرێ، خـەڵکە ئیمـان دارەکـانن. ﴿وکفی بربك وکیلا﴾ تۆش پەروەردگارت پارێزەرو چاودێرو پشتیوانت بێت، بەستە.

## گەمیی ناو دە ریاکان نیشانەی دلۆڤانی خوایە:

﴿[٦٦] ربکم الذی یزجی لکم الفلك فی البحر لتبتغوا من فضله﴾ پەروەردگاری ئێوە ئەی خەڵکینە! هەرئەو زاتە دەسەڵاتدارەیە کەشتییەکانتان بەناو دەریـادا بەهۆی (با)وە هاتووچۆ پێدەکات، یان بە هـۆی کارەباو بەنزینـەوە، بۆئەوەی رزق و ڕۆزیی بێشوماری خوا بەدەست بێنن و ژیوار پەیدا بکەن ﴿إنه کان بکم رحیما﴾ چونکە ئەو (خوا)یە لەگەڵ ئێوەدا هەمیشە بە بەزەیی و بەرەحمە، بۆیە هـۆی ژیانتـان بـۆ ئاسان دەکات، جا ئیتر ئێوە پاش ئەو هەموو نازو نیعمەتانە چۆن هاوبەشی بۆدا ئەنێن؟!

## کافریش لە تەنگانەدا هاوار بۆ خوا دەبا:

﴿[٦٧] وإذا مسکم الضر فی البحر ضل من تدعون إلا إیاه﴾ وهـەرکاتیش ئێوە لـەناو دەریـادا تووشـی ناخۆشـیی و زەرەرو کۆسپێك بێن، وەك نقوم بوون و بەرەو هەلدێر چوون، هەرخواتان لەبیر دەمێنێ و، هەرچی پەرستراوێك هەیە لە بیرتان دەچێ و، باوەڕتان بەهیچ شتێکی تـر نـامێنێ ﴿فلمانجاکم إلی البر أعرضتم﴾ کەچی هـەر ڕزگاری کـردن و بەرەو وشکانی چوون، خێرا ڕوو وەر دەچەرخێنن لە پەرستنی خوا بە تاك وتەنیا و، کوفری نیعمەت دەکەن!﴿وکان الانسان کفورا﴾ ومرۆڤ بەرامبەر بە خوا هەرئاوا ناشکورو سپڵە بووە ﴿[٦٨] افأمنتم ان یخسف بکم جانب البر﴾ ئەوساتە لە دەریا ڕزگارتان بوو، ئاخۆ لەوە دڵنیان کە لە بەشێك لە وشکانییدا نەعرۆتان بکاو بەزەوییدا ڕۆچن؟ ﴿او أن یرسل علیکم حاصبا﴾ یان بەردە بارانتان نەکات، وەکو بەردەبارانی گەلی (لووط)ی کرد؟ ﴿ثم لا تجدوالکم وکیلا﴾ لـە پاشانیش هـیچ یـارو سـەر پەرشـتیکەرێکتان دەست نەکـەوێت، لـەو سزایە ڕزگارتـان بکـات، لـەئا یـەتێکی تـردا دەفەرموێ: (إنا أرسلنا علیهم حاصبا إلا آل لوط نجیناهم بسحر.نعمة من عندنا) یان دەفەرموێ: (ءأمنتم من فی

السماء أن يخسف بكم الأرض فإذا هی تمور. أم أمنتم من فی‌السماء أن يرسل عليكم حاصبا فستعلمون كيف نذير)
﴿٦٩ ام امنتم ان يعيدكم فيه تارة اخرى﴾ یا دوای ئەوە کە لە دەریا رزگاری کردن، لەوە دڵنیان کە بۆ
جارێکیترناتانگێڕێتەوە ناو دەریاکە ﴿فيرسل عليكم قاصفا من الريح﴾ جا بایەکی تێکشکێنەرو توند بنێرێتە
سەرتان ﴿فيغرقكم بما كفرتم﴾ ئەوجابە هۆی کافریی‌و بێ باوەڕیتانەوە نقومتان بکا لەدەریاکە ﴿ثم لا تجدوا لكم
علينا به تبيعا﴾ ئەوسا هیچ پشتیوان و یارمەتیدەرێکتان دەست نەکەوێ داوای خوێنەکەتان بکات لێمان، کەواتە بۆ
ئەوەندە لارو لاسارن؟!

**ئادەمزاد رێزدارە:**

الجزء الخامس عشر — سورة الإسراء

وَإِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فِي ٱلْبَحْرِ ضَلَّ مَن تَدْعُونَ إِلَّآ إِيَّاهُ فَلَمَّا نَجَّىٰكُمْ
إِلَى ٱلْبَرِّ أَعْرَضْتُمْ وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ كَفُورًا ٦٧ أَفَأَمِنتُمْ أَن يَخْسِفَ
بِكُمْ جَانِبَ ٱلْبَرِّ أَوْ يُرْسِلَ عَلَيْكُمْ حَاصِبًا ثُمَّ لَا تَجِدُوا۟ لَكُمْ
وَكِيلًا ٦٨ أَمْ أَمِنتُمْ أَن يُعِيدَكُمْ فِيهِ تَارَةً أُخْرَىٰ فَيُرْسِلَ
عَلَيْكُمْ قَاصِفًا مِّنَ ٱلرِّيحِ فَيُغْرِقَكُم بِمَا كَفَرْتُمْ ثُمَّ لَا تَجِدُوا۟
الحزب ٢٩ لَكُمْ عَلَيْنَا بِهِۦ تَبِيعًا ٦٩ ۞ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ وَحَمَلْنَٰهُمْ
فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَىٰ
كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا ٧٠ يَوْمَ نَدْعُوا۟ كُلَّ أُنَاسٍۭ
بِإِمَٰمِهِمْ فَمَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ يَقْرَءُونَ
كِتَٰبَهُمْ وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلًا ٧١ وَمَن كَانَ فِي هَٰذِهِۦٓ
أَعْمَىٰ فَهُوَ فِي ٱلْءَاخِرَةِ أَعْمَىٰ وَأَضَلُّ سَبِيلًا ٧٢ وَإِن كَادُوا۟
لَيَفْتِنُونَكَ عَنِ ٱلَّذِيٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ لِتَفْتَرِيَ عَلَيْنَا غَيْرَهُۥ
وَإِذًا لَّٱتَّخَذُوكَ خَلِيلًا ٧٣ وَلَوْلَآ أَن ثَبَّتْنَٰكَ لَقَدْ كِدتَّ
تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْـًٔا قَلِيلًا ٧٤ إِذًا لَّأَذَقْنَٰكَ ضِعْفَ
ٱلْحَيَوٰةِ وَضِعْفَ ٱلْمَمَاتِ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ عَلَيْنَا نَصِيرًا ٧٥

٢٨٩

﴿٧٠ ولقد كرمنا بنى آدم﴾ وبێ‌سۆ ئێمە ڕێزێکی زۆرمان
لەتۆرەمەو نەوەی ئادەم گرت: زانیاریی و، ژیریی و، قەدو
قامەتی ڕێک و جوانمان پێ بەخشیی، کە ئەوەمان بۆ
گیانلەبەرانی تر نەکردووە،وەکو خوا لەجێیەکی تردا
دەفەرموێ: (لقد خلقنا الإنسان فی أحسن تقويم) التين/٤.
یان دەفەرموێ: (وصوركم فأحسن صوركم)غافر/٦٤.
﴿وحملناهم فی البر والبحر﴾ و لەوشکانیی و، لەدەریادا
هەڵمانگرتن بەو شێوە کە کەشتیی و جۆرەها هۆی ترمان بۆ
گواستنەوەیان پێدان, ئەوەتا ئێستایش سەرەڕای ئەوانە،
خەریکە تەواوی زەویی و بۆشاییەکانی ئاسمانیش
دەپشکێنێ ﴿ورزقناهم من الطيبات﴾ وڕزق و ڕۆزی
پاکیشمان پێدان ﴿وفضلناهم على كثير ممن خلقنا
تفضيلا﴾ نەک هەر ئەوەندە، بەڵکو (وەکو ئیبن کەسیر) دەڵێ:
لەچاو زۆرێک لەدروستکراوەکانی خۆمان
بەفریشتەکانیشەوە پتر قەدرو ڕێزمان گرتوون، بۆیە زاناکان
دەڵێن: جنسی ئادەمزاد لە جنسی فریشتە بەرێزترن ﴿٧١
يوم ندعوا كل أناس بإمامهم﴾ ئەو ڕۆژەیشیان وەبیربێنە کە
هەموو کۆمەڵەخەڵکێك بۆ لێپرسینەوە، بە نامەی کرداریان بانگ دەکەین ﴿فمن اوتى كتابه بيمينه﴾ جاهەرکەسێ
نامەو دۆسیەی کرداری بدرێتە دەستیی ڕاستیی" کە ئەوشێوەیەش نیشانەی بەختیاریی و سەرفرازییە ﴿فاولئك
يقرؤن كتابهم﴾ جائەوانە بەشادیی و بەخۆشییەوە نامەی کردەوەکانی خۆیان دەخوێننەوە، چونکە نامەکەیان
دراوەبەدەستی ڕاستیانەوە کە نیشانەی بەختیارییە ﴿ولا يظلمون فتيلا﴾ و بەئەندازەی تاڵی ناو ناوکە خورمایەك
(واتە: کەمترین شت) ناحەقیی و ستەمیان لێناکرێ. ﴿٧٢ ومن كان فی هذه اعمى﴾ هەر کەسیش لەم دنیایەدا، کوێر
بوو بێت لە ئاستی هەق، واتە: دڵ و دەروونی هەقی وەر نەگرتبێ و لەڕێی ڕاستی دینی ئیسلام لای دابێ ﴿فهو فی
الآخرة اعمى واضل سبيلا﴾ ئەوە لەپاشەڕۆژیشدا چاوی کوێرەو, سەرلێشێواو تریش دەبێ. واتە: هیچ ڕێیەکی
هیدایەتیان وەچنگ نایە.

**دەیانەوێ بەرنامەکەی خوایان بۆ بگۆڕیت:**

(سیووتی) دەڵێ: پەیامبەر ﷺ لەتەواف و چەرخەکانی ماڵی خوادا هەمووجار دەستی لەبەردە رەشەکە دەدا، قورەیشیش ویستیان تا هێما بۆخواکانی ئەوانیش ئەکا نەهێڵن تەوافەکەی بکات، ئەویش لەبەربێ دەسەلاتیی و، خۆشە ویستی کابەی ماڵی خوا،هێندەی نەما بوو نەرم ببێ و بە گوێیان بکات، گەرچی لەدڵیشەوە زۆری پێ ناخۆش بوو. جا ئەمم ئایەتە هات وفەرمووی: ﴿٧٣ وإن كادوا ليفتنونك عن الذى اوحينا إليك﴾ بێگومان ئەوەندەی نەمابوو موشریك وبێ باوەڕەکان سەبارەت بەو قورئانەی ئێمە بەوەحیی بۆمان ناردووی کلات بکەن و لەخشتەت بەرن و لەهەندێ فەرمانمان بترازێیت ﴿لتفترى علينا غيره﴾ تا شێوازی بانگەوازەکەت بگۆڕی و غەیری قورئانیان بۆ بخوێنیتەوەو، درۆ لەسەر ئێمە هەڵبەسیت. ﴿وإذا لأتخذوك خليلا﴾ ئیتر کردبایتیان بە دۆست و خۆشەویستیان و، دەبوویتە پیاوی چاك ﴿٧٤ ولولا ان ثبتناك لقد كدت تركن إليهم شيئا قليلا﴾ دیارە ئەگەر خۆمان توندرامان نەگرتبایت و دەستمان پێتەوە نەبوایە، خەریك بوو لەخشتەت بەرن و، کەمێ بەلای ئەواندا بڕۆیت و بەگوێیان بکەیت ﴿٧٥ إذا لأذقناك ضعف الحياة وضعف الممات﴾ چاك بزانە ئەوکاتەیش هەرلەم ژیانی دونیایەدا دوو بەرامبەر سزامان دەدایت، لەمەر گییشدا هەردووبەرابنەری ئەوان سزامان پێدەچەشتیت، چونکە گوناهی پێغەمبەرو زانایان لەتاوانی خەڵکانی تر گەورەترە، بۆیە سزایشیان دوو بەرامبەرە ﴿ثم لا تجدلك علينا نصيرا﴾ ئەوسا کەسیشت دەس نەدەکەوت بێتە هاناتەوە ﴿٧٦ وإن كادوا ليستفزونك من الأرض لتخرجوك منها﴾ و بەڕاستیی ئەوەندەی نەمابوو موشریکەکانی قورەیش لەوسەر زەویی‌و خاکەی (مەککە)دا زۆرت بۆبێنن و سەخڵەتت بکەن بۆ ئەوەی شار بەدەرت بکەن ﴿وإذا لا يلبثون خلافك إلا قليلا﴾ ئەگەر واش با، بەدوای تۆشدا خۆیشیان ئەوەندە نەدەمانەوەو زو بەزوو لەناومان دەبردن،چونکە یاسای خوایە کە هەرگەلێك پەیامبەرەکەیان دەربکەن، خوا بەزوویی تۆڵەیان لێ دەسێنێ، بەلام ئەوەیان پێ نەکرا، بەڵکو خوا فەرمانی دا کۆچ بکات بۆمەدینە ﴿٧٧ سنة من قد ارسلنا قبلك من رسلنا﴾ باوو سوننەتی خۆمانەکە:هەر پەیامبەرێکمان لەپێش تۆشەوە ناردبێ و، ئەزیەت و ئازار درابێ، ئەوا لەوخەڵکەمان تێکداوە و تۆڵەمان لێکردوونەتەوە ﴿ولا تجد لسنتنا تحويلا﴾ هەرگیز نابینیت سوننەت و باوی ئێمە گۆڕانی بەسەردا بێ و بگۆڕدرێت، بۆیە پاش ساڵ و نیوێ لەهاتنی ئەم ئایەتە، لەناکاوجەنگی(بەدر) پەیدابووو جەزرەبەی دان.

الجزء الخامس عشر — سورة الإسراء

وَإِن كَادُواْ لَيَسْتَفِزُّونَكَ مِنَ ٱلْأَرْضِ لِيُخْرِجُوكَ مِنْهَا
وَإِذًا لَّا يَلْبَثُونَ خِلَٰفَكَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٧٦﴾ سُنَّةَ مَن قَدْ
أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِن رُّسُلِنَا وَلَا تَجِدُ لِسُنَّتِنَا تَحْوِيلًا ﴿٧٧﴾ أَقِمِ
ٱلصَّلَوٰةَ لِدُلُوكِ ٱلشَّمْسِ إِلَىٰ غَسَقِ ٱلَّيْلِ وَقُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ إِنَّ
قُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا ﴿٧٨﴾ وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَتَهَجَّدْ بِهِۦ
نَافِلَةً لَّكَ عَسَىٰٓ أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَّحْمُودًا ﴿٧٩﴾ وَقُل رَّبِّ
أَدْخِلْنِى مُدْخَلَ صِدْقٍ وَأَخْرِجْنِى مُخْرَجَ صِدْقٍ وَٱجْعَل لِّى مِن
لَّدُنكَ سُلْطَٰنًا نَّصِيرًا ﴿٨٠﴾ وَقُلْ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَزَهَقَ ٱلْبَٰطِلُ
إِنَّ ٱلْبَٰطِلَ كَانَ زَهُوقًا ﴿٨١﴾ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ
وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا ﴿٨٢﴾ وَإِذَآ
أَنْعَمْنَا عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ أَعْرَضَ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ كَانَ يَـُٔوسًا
﴿٨٣﴾ قُلْ كُلٌّ يَعْمَلُ عَلَىٰ شَاكِلَتِهِۦ فَرَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَنْ هُوَ أَهْدَىٰ
سَبِيلًا ﴿٨٤﴾ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى
وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٨٥﴾ وَلَئِن شِئْنَا لَنَذْهَبَنَّ
بِٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ بِهِۦ عَلَيْنَا وَكِيلًا ﴿٨٦﴾

٢٩٠ إِلَّا رَحْمَةً

**دەبێ نوێژ لەکاتی خۆیدا بکرێت:**

﴿[٧٨] اقم الصلاة لدلوك الشمس إلى غسق الليل﴾ نویجـژه فـەرزەكان ئـەو كاتـەی خـۆر كلادەبیٚ‌و لەناوەڕاستی ئاسمان لادەدا نوێژەكەی (نیوەڕۆو عەسر)ت بكە، كاتێكیش تاریكی شەو داهات، نوێژەكەی (شێوان و خەوتنان)ت ئەنجام بدە ﴿وقرآن الفجر﴾ وەنوێژەكەی بەیانیشت بەچاكی ئەنجام بدەو قورئانی زۆریشی تێدا بخوێنە،، هەر لەبەر ئەمەیشە ئەو نوێژە بە (قورئان) لێكدراوەتەوە ﴿إن قرآن الفجر كان مشهودا﴾ چونكە بێگومانە كە قورئان خوێندنی نوێـژی سپیدەی بەیانیان فریشتەكانی شەوو ڕۆژی تێدا جەم دەبێت، وەكو(ئەبو هورەیرە) لـە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتـەوەو، ئیمامی(بوخاری)یش ئـەم فـەرموودە یـە دێنێت: ((فضل صلاة الجمع على صلاة الواحد، خمس وعشرون درجة، وتجتمع ملائكة اليل وملائكة النهار فى صلاة الفجر))﴿[٧٩] ومن الليل فتهجد به نافلة لك﴾ وە لەبەشێكی شەویشدا خۆت ماندوو بكە بە شەونوێژەوە و قورئانی زۆری تیا بخوێنە، ئەمەش بەهرەیەكی تایبەتەو، دراوە بەتۆو زیادە لەفەرزەكانیشە، لەپێغەمبەر ﷺ دەپرسن: پاش نوێژە فەرزەكان چ نوێژێ باشترە؟ فەرمووی: شەونوێژ.(موسلیم/ كتاب الصيام ٨٢١/٢) ﴿عسى ان يبعثك ربك مقاما محمودا﴾ بە ئومێد بەپەروەردگارت بتنێرێتە شوێن و جێگایەكی پەسەندو بەرێزەوە(مەقامەلمەحموود) پێشینان و پاشینانیش سوپاست بكەن،ئەو جێگایەش پێیدەڵێن: (الشفاعة العظمى) لەوێ تكا بۆ هەموو موسڵمانان بەگشتیی دەكرێت، لە پێغەمبەر ﷺ دەپرسن: پاش نوێژە فەرزەكان چ نوێژێ گەورە ترە؟ فەرمووی: (صلاة اليل) موسلیم. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: هەركەسێك وەڵامی بانگ بداتەوەوپاشان ئەم دوعایەی: (اللهم رب هذه الدعوة التامة والصلاة القائمة آت محمدا الوسيلة والفضيلة، وابعثه مقاما محمودا الذى وعدته)) بخوێنێ، ئەوا لە ڕۆژی قیامەتدا بەر شەفاعەتی من دەكەوێ. فتح الباری: ٣٩٩/٨ ﴿[٨٠] وقل رب ادخلني مدخل صدق﴾ ئەی موحەممەد! ﷺبڵێ: پەروەردگاری من! لەهەر جێگایە هەم و، هەر كارێكم بەدەستەوە بێ، هاوكاریی و یارمەتیم بدە بۆ ئەنجامدانی، چ لەدونیاو چ لەپاشە ڕۆژدا، تابەڕاست و ڕاستانەبتوانم ئەنجامی بدەم، واتە: با هەردەم جێگەی ڕەزامەندی تۆ بێت، پێغەمبەر ﷺهەتا لەمەدینەدابوو لە ژێر ئازارو بێزارێكی زۆردا دەژیا، ئەوسا كەخوا موڵەتی هیجرەتی دا بۆمككە، ئەم ئایەتەی: (وقل رب ادخلني مدخل صدق واخرجني مخرج صدق واجعل لى من لدنك سلطانا نصيرا) هاتەخوارێ. ﴿واخر جني مخرج صدق﴾ بە ڕاست و ڕاستانەو سەرفرازانەش لەوجێگایەدا بەڕێم بكە.

**بەكورتیی:** چوونم بۆ هەر جێگایەك هەر لە بەرڕەزامەندی و خۆشنوودی تۆ بێت، دەرچوونیشم بۆ هەر جێگایەك: بۆ مدینە، بۆ فەتحی مككە، چونە گۆڕەوە، لە گۆڕ بۆ زیندوو بوونەوە، بائەمانە گش بە پێی مەیل و خواستی تۆبێ و، بتوانم بە باشی لێیان بچمە دەرێ ﴿واجعل لى من لدنك سلطانا نصيرا﴾ هێزێكی پشتیوان‌و یارمەتی دەریشم بۆ دیاری بكە ﴿[٨١] وقل جاء الحق وزهق الباطل﴾ وە لە لای خۆتەوە بەبەردەوامی بڵێ: تازە وا هەق و ڕاستیی –كە ئایینی پیرۆزی ئیسلامە– هات‌و دەركەوت و بەتاڵو چرووك و ناهەق و شیرك و بێ باوەڕیی هەڵوەشاو نەما ﴿إن الباطل كان زهوقا﴾ دیارە كە باتڵ وكاری ناڕەوا، بەشی هەر تیاچوون‌و تەفرو توونابوو و نەمانە، چونكە پایەدارو ریشەدار نییە، ئەم ئایەتەیش هەر دووپاتی ئەو ڕاستییەدكاتەوە كە دەفەرموێ (بل نقذف بالحق على الباطل فيدمغه فإذا هو زاهق). ئیمامی(بوخاریی) لە(عەبدو اللە)ی كوڕی (مەسعوود)ـە دەڵێت:كەپێغەمبەر ﷺ چووە (مەككە)وە، دیتی لەدەورو بەری (كابە)دا (٣٦٠) بت دانراوە، ئەوسا بەدارەكەی دەستی لێیدەدان و دەیفەرموو: (جاء الحق وزهق الباطل إن الباطل كان زهوقا.جاء الحق ومايبدىء الباطل ومايعيد) فتح الباری:٢٥٢/٨.

### قورئان شفایه بۆ ئیمانداران:

﴿[٨٢] وننزل من القرآن ما هو شفاء ورحمة للمؤمنين﴾ ئێمە لەم قورئانەدابۆتۆمان ناردووە ئەی موحەممەد! ﷺ گەلێ‌ئایەت و سوورەت دادەبەزێنین کەمایەی شیفاو چاکبوونەوەیە لەنەخۆشیی نەفامیی و گومڕایی و سەرلێشێواویی دڵەکان" ڕەحمەت وبەزەیی و میهرەبانیشە بۆ خەڵکانی بڕوادار ﴿ولا يزيد الظالمين إلا خسارا﴾ لەگەڵ ئەمەیشدا بۆستەمکاران و خوانەناسان جگە لەمە کە دەبێتە مایەی زیان بۆیان و،پتر یاخییبوونیان شتێ تر زیاد ناکات بۆیان، چونکە خۆیان ئامادە نین هیچ سوودێکی لێوەرگرن! ﴿[٨٣] وإذا انعمنا على الإنسان اعرض ونأى بجانبه﴾ وەهەرکات نازو نیعمەتێ وەك سەروەت و سامان، تەندروستیی و ئەمن و ئاسایش بەمرۆڤ دەبەخشین،ئەو خێرا لەخۆبایی دەبێ و، لەفەرمانی خوا ڕوو وەر ئەگێڕێ و دوور ئەکەوێتەوە لەهەق ﴿وإذا مسه الشر كان يئوسا﴾ هەرکاتیش تووشی بەڵاو عەزیەت و تەنگانەیەك دەبێت بەتەواویی مەیووس و نائومێد دەبێ لەمیهرەبانی خوا!، وەکو ئەم ئایەتەیش دەفەرموێ: (ولئن أذقنا الإنسان منا رحمة ثم نزعها منه إنه ليؤس كفور ولئن اذقناه نعماء بعد ضراء مسته ليقولن ذهب السيآت عنى إنه لفرح فخور. إلاالذين صبروا..) ﴿[٨٤] قل كل يعمل على شاكلته﴾ بڵێ: با هەردوولا (کافرو بڕوادار) لەسەر بیرو بۆچوونی خۆی چۆنی بۆ دەکرێ کار بکات" ئەگەر دڵ و دەروون پاك بێت، ئەوا کارو کرداری پاکی لێ دەوەشێتەوە، ئەگینا بەپێچەوانەوە ﴿فربكم أعلم بمن هو أهدى سبيلا﴾ دڵنیاش بە پەروەردگارت لەهەموو کەس چاکتر دەزانێ بەحاڵی ئەو کەسە لەئێوە شارەزاترە، وەیا سەرلێشێواوترەو ڕێگەی هەڵەی کردووە،واتە: خوای گەورە هەموو دەناسێ و دەزانی چی دەکەن، بۆ خۆیشی حیسابیان لە گەڵ دەکات، ئیتر ئێستا چۆن ڕەفتار دەکەن با بیکەن.

### ڕۆح (گیان) چییە؟

(ئیبن جەریر) دەڵێت: خاوەن نامەکان لەپێغەمبەریان پرسی: دەبێ (ڕۆح) چی بێت؟ ئەوسا ئەم ئایەتە هات و فەرمووی: ﴿[٨٥] ويسألونك عن الروح﴾ وە لەبابەت (ڕۆح)ەوە لێت دەپرسن ودەڵێن: باشە ئەو ڕۆحەی کە هۆی ژین و زیندوێتیی ئادەمیزادە چییە، ئایا شتێکی کۆنە، تازەیە، هەقیقەتی هەیە؟! ﴿قل الروح من أمر ربى﴾ پێیان بڵێ: ڕۆح منیش هیچی لێ نازانم،چونکە لەفەرمانە نهێنییەکانی پەروەردگارمە، بەدەسەڵاتی خۆی بەدیهێناوە و، مرۆڤ و گیانلەبەرانی پێ دەجوڵێ و دەژی، ئەوەهەر خۆی لێی بەئاگایە ﴿وما أوتيتم من العلم إلا قليلا﴾ وە ئێوە بەتایبەتی لەبابەت ڕۆحەوەبەشێکی کەم زانیاریتان پێدراوە، کەوابوو دەملەهەموو شتێك مەکوتن و بێ چەندو چۆن خۆ بەدەسەوە بدەن زۆر باشترە، ئەمەیش ئەوە ناگەیەنێت کە مرۆڤ دەبێ دەرگای هەموهەوڵ وتێکۆشانێك لە خۆی دابخات، بەڵکو تەنها ئەوە دەگەیەنێت کە: بۆعەقڵ و ژیریی مرۆڤ سنوورێك دانراوە، لەوە بەولاوە ڕێ دەرناکات، کەوابوو بێدەنگ بوون لە (ڕۆح) خێرو قازانجە بۆی.

### گەر بمانەوێ قورئانیش دەبەینەوە:

﴿[٨٦] ولئن شئنا لنذهبن بالذى اوحينا إليك﴾ و بێ سوێش ئەو قورئانە بۆمان سروش کردوویت،ئەگەر بمانەوێ‌لەناو بەرین و لێت وەرگرینەوەو لەسنگتا بیسرینەوە ئەوا زۆر بەئاسانی دەیسرینەوەو، ئەمەیش ناهێڵین، (عەبدوللە)ی کوڕی (مەسعوود) دەڵێت: لە ڕۆژەکانی ئاخر زەماندا لەلای (شام)ـە وە (با)یەك هەڵدەکاو هەموو خەڵکی دەگرێتەوەو، پاشان هەرچی قورئان لەسینگ و، لە (موصحەف) دایە هەموو دەسرێتەوەو لەبیر دەچێتەوەو گوتیشی ئەمەیە کە خوا دەفەرموێ: (ولئن شئنا لنذهبن بالذى اوحينا إليك..) ﴿ثم لا تجد لك به علينا كيلا﴾

ئەوجا هیچ کەسیشت دەست ناکەوێ بەرگریت لێ بکاو نەهێڵێت کارەکەمان ئەنجام بدەین، واتە: چۆنمان وەحیی بۆ کردوویت، هەر ئاواش بەئاسانی دەتوانین لێت وەرگرینەوە ﴿[٨٧] **إلا رحمة من ربك**﴾ بەڵام ئێمە ئەوکارە ناکەین، چونکە رەحمەتی پەروەردگارت فراوانە، واتە: ئێمە بەمیهرەبانی خۆمان هەر دەیهێڵینەوە، جا کەواتە تۆش دڵخۆشبە بەکارەکەت و مەوەستە ﴿**إن فضله كان عليك كبيرا**﴾ بەڕاستیی فەزڵ و میهرەبانیخوا زۆرە بەسەرتەوە، ئەوەتە کردوێتی بە پەیامبەرو بەرنامەی پێداویی و رەوانەی کردویت بۆ گشتی جیهانیان ﴿[٨٨] **قل لئن اجتمعت الإنس والجن**﴾ بڵێ: ئەگەر هەموو مرۆڤ و جینییە رەوانبێژو بیر تیژو وریاو زیرەکەکان کۆببنەوە ﴿**على أن يأتوا بمثل هذا القرآن**﴾ بۆ ئەوەی وێنەی ئەم قورئانە بهێنن ﴿**لا يأتون بمثله ولوكان بعضهم لبعض ظهيرا**﴾ هەرگیز ناتوانن وێنەی ئەو بهێنن، ئەگەرچی هەندێکیان پاڵپشت وهاوکاری هەندێکیان بن بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە! کافران وتیان: ئەگەر بمان ویستبا وەك ئەم قورئانە بڵێین دەمانگوت، ئەوجائەم ئایەتەی(قل لئن اجتمعت الإنس والجن..) هاتە خوارێ ﴿[٨٩] **ولقد صرفنا للناس في هذا القرآن من كل مثل**﴾ بێگومان ئێمە لەم قورئانەدا چەندین نەزیلەو ئایەت و بەڵگەی جۆراو جۆرمان بۆخەڵکی هێناوەیەوە تا پەندو ئامۆژگاری لێ وەردەگرن وئیمان پێ بێنن ﴿**فأبى أكثر الناس إلا كفورا**﴾ کەچی لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگەڕۆشنانە دا هێشتای زۆربەی خەڵکی هەر ملە جێڕیێ و سپڵەیی و نکووڵی هەق دەکەن.

**بڕوبیانووی قورەیش:**

﴿[٩٠] **وقالوا لن نؤمن لك حتى تفجر لنا من الأرض ينبوعا**﴾ لە گەڵ ئەو هەموو بەڵگانەدا موشریکە خۆبە زلزانەکانی مەککە دوای ئەوەی کە لە بەربەرکانێ کردن لەگەڵ قورئاندا بێ ئومید بوون و پەکیان کەوت گوتیان: هەرگیز ئێمە بڕوات پێ ناکەین ئەی موحەممەد! ﷺ تا لەو زەوییە وشکەی مەککەیە کانی ئاوێکمان بۆ هەڵنەقوڵێنیت و ئاوەکەیشی هەمیشە و بەردەوام بێت ﴿[٩١] **او تكون لك جنة من نخيل وعنب**﴾ یا خود باغێکی پڕلە خورماو ترێت هەبێ ﴿**فتفجر الأنهار خلالها تفجيرا**﴾ و جۆگەو چۆمە ئاوو رووباری زۆرو فراوان لەناویا هەڵقوڵێنی و بە بندارەکانییدا بەخوڕم بڕوات ﴿[٩٢] **أوتسقط السماء كما زعمت علينا كسفا**﴾ یاخود پارچەپارچەی ئەم ئاسمانەمان بەسەردا بخەیت، هەر وەکو خۆت خەیاڵت دەکردو دەت ترسانین و، هەڕەشەت لێ دەکردین و پێت دەگوتین: ئەگەر بڕوا نەهێنن خوا سزاتان ئەدات ﴿**أوتأتي بالله والملائكة قبيلا**﴾ یاخود خوای گەورەو فریشتەکانی هەردوو بێنە پێش چاومان و ڕووبەڕوومان بکەیت و بیان بینین ﴿[٩٣] **أويكون لك بيت من زخرف**﴾ یا ماڵو کۆشکێکی گەورەت لەزێڕ هەبێ و نەخشێنرابێت، ﴿**أوترقى في السماء**﴾ وەیان لە پێش چاوماندا بەرەو ئاسمان سەرکەویت ﴿**ولن نؤمن لرقيك حتى تنزل علينا كتابا نقرؤه**﴾ هیمان بە وەش هەر

الجزء الخامس عشر — سورة الإسراء

إِلَّا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ ۚ إِنَّ فَضْلَهُۥ كَانَ عَلَيْكَ كَبِيرًا ﴿٨٧﴾ قُل
لَّئِنِ ٱجْتَمَعَتِ ٱلْإِنسُ وَٱلْجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأْتُوا۟ بِمِثْلِ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ
لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِۦ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا ﴿٨٨﴾ وَلَقَدْ
صَرَّفْنَا لِلنَّاسِ فِى هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ مِن كُلِّ مَثَلٍ فَأَبَىٰٓ أَكْثَرُ ٱلنَّاسِ
إِلَّا كُفُورًا ﴿٨٩﴾ وَقَالُوا۟ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ تَفْجُرَ لَنَا مِنَ
ٱلْأَرْضِ يَنۢبُوعًا ﴿٩٠﴾ أَوْ تَكُونَ لَكَ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَعِنَبٍ
فَتُفَجِّرَ ٱلْأَنْهَٰرَ خِلَٰلَهَا تَفْجِيرًا ﴿٩١﴾ أَوْ تُسْقِطَ ٱلسَّمَآءَ كَمَا
زَعَمْتَ عَلَيْنَا كِسَفًا أَوْ تَأْتِىَ بِٱللَّهِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ قَبِيلًا ﴿٩٢﴾
أَوْ يَكُونَ لَكَ بَيْتٌ مِّن زُخْرُفٍ أَوْ تَرْقَىٰ فِى ٱلسَّمَآءِ وَلَن نُّؤْمِنَ
لِرُقِيِّكَ حَتَّىٰ تُنَزِّلَ عَلَيْنَا كِتَٰبًا نَّقْرَؤُهُۥ ۗ قُلْ سُبْحَانَ رَبِّى هَلْ
كُنتُ إِلَّا بَشَرًا رَّسُولًا ﴿٩٣﴾ وَمَا مَنَعَ ٱلنَّاسَ أَن يُؤْمِنُوٓا۟ إِذْ جَآءَهُمُ
ٱلْهُدَىٰٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓا۟ أَبَعَثَ ٱللَّهُ بَشَرًا رَّسُولًا ﴿٩٤﴾ قُل لَّوْ كَانَ
فِى ٱلْأَرْضِ مَلَٰٓئِكَةٌ يَمْشُونَ مُطْمَئِنِّينَ لَنَزَّلْنَا عَلَيْهِم
مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَلَكًا رَّسُولًا ﴿٩٥﴾ قُلْ كَفَىٰ بِٱللَّهِ
شَهِيدًۢا بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرًۢا بَصِيرًا ﴿٩٦﴾

٢٩١

باوەڕت پێناکەین، هەتا لە گەڵ خۆتدا نامەیەکمان بەزمانی خۆمان بۆ دێنیّ و بیخوێنینەوەو ددان بە پێغەمبەرێتی تۆدابنێن‌!! هەر بۆ کەللە رەقییئەوانەوەیە کە خوای گەورە لە هەندێ جێگای تردا دەفەرموێ: (إن الذين حقت عليهم كلمة ربك لايؤمنون. ولو جاءتهم كل آية حتى يروا العذاب الأليم). ﴿قل سبحان ربى﴾ بلێ: پاك و خاوێنی و بێگەردی هەر بۆپەروەردگارەکەمە، لەوەی کە ئێوە پێشنیاری لەسەر دەکەن" بۆچی من چیم تا ئەوانە داوای شتم لێ بکەن؟ ﴿هل كنت إلا بشرا رسولا﴾ مەگەر من تەنها پێغەمبەرێك نیم لە گرۆی ئادەمیزاد؟ جا ئیتر ئەو هەموو ئیقتراح و پێشنیازانەتان لە چییە؟! ﴿[٩٤] وما منع الناس ان يؤمنوا إذ جاءهم الهدى﴾ هیچ شتێ نەبۆیە کۆسپ و ڕێ لەخەڵکی بگرێت بۆ باوەڕهێنانیان ئەوەدەمە کە ڕێ نیشاندەرو پێغەمبەریان بۆ هات ﴿إلا ان قالوا ابعث الله بشرا رسولا﴾ ئەمە نەبێت کە بەسەرسامییەوە دەیانگوت: جا چۆن دەبێت خوالە خودی ئادەمزاد پێغەمبەرێك بنێرێ؟! ئەی بۆچی فریشتە بڕابوو؟ جالەبەر ئەوەئێمە بڕوا ناهێنین، لە سەرەتای(یونس)یشدا هەمان برووبیانوویان هاتووەو دەفەرموێ: (اكان للناس عجبا ان اوحينا إلى رجل منهم..)﴿[٩٥] قل لو كان فى الأرض ملائكة يمشون مطمئنين﴾ پێیان بلێ: ئەگەر لەزەوییدا لەباتی ئادەمزادی ئێستا، فریشتە هەبووباو بە دڵنیایی ڕۆشتبان ﴿لنزلنا عليهم من السماء ملكا رسولا﴾ دیارە ئێمەش ئەوکاتە لە ئاسمانەوە پەیامبەرێکی فریشتەمان بۆ دەناردن" چونکە پێغەمبەر دەبێ هەر لەجۆری خۆیان بێت" تا لەیەکتر تێ بگەن و، باو و نەریتی یەکتری بزانن، بەلام خۆ ئێستا ئادەمزاد پێغەمبەرە، کەوابوو پێغەمبەریش دەبێ لە ئادەمزاد بێت، لە سەرەتای سوورەتی(ئەنعام)یشدا ئەو داواکاریی و ڕەخنەیە هێناوەو دەفەرموێ: (وقالوا لولا انزل عليه ملك ولو انزلنا ملكا لقضى الأمر ثم لاينظرون.ولو جعلناه ملكا لجعلناه رجلا وللبسنا عليهم مايلبسون) ﴿[٩٦] قل كفى بالله شهيدا بينى وبينكم﴾ بلێ: هەر خوا بەسە شایەدبێت لەنێوان ئێمەو ئێوەدا بۆ ڕاست و درۆیی من و،لاریی و سەرلێشێواوی ئێوە ﴿إنه كان بعباده خبيرا بصيرا﴾ چونکە بەڕاستیی ئەو (خوا)یە سەبارەت بەبەندەکانی خۆی زۆر بەئاگاو بینایە" دەزانێ کێ لەدین لادەدا و سەرگەردان دەبێت، کێیش بەرەو هەق دێ و بەختیاربێت، دەسا ئیتر چی دەڵێن، باهەر بیلێن.

الجزء الخامس عشر — سورة الإسراء

وَمَن يَهۡدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلۡمُهۡتَدِۖ وَمَن يُضۡلِلۡ فَلَن تَجِدَ لَهُمۡ أَوۡلِيَآءَ
مِن دُونِهِۦۖ وَنَحۡشُرُهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمۡ عُمۡيٗا وَبُكۡمٗا
وَصُمّٗاۖ مَّأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ كُلَّمَا خَبَتۡ زِدۡنَٰهُمۡ سَعِيرٗا ٩٧
ذَٰلِكَ جَزَآؤُهُم بِأَنَّهُمۡ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَقَالُوٓاْ أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمٗا
وَرُفَٰتًا أَءِنَّا لَمَبۡعُوثُونَ خَلۡقٗا جَدِيدًا ٩٨ ۞ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّ ٱللَّهَ
ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ قَادِرٌ عَلَىٰٓ أَن يَخۡلُقَ مِثۡلَهُمۡ
وَجَعَلَ لَهُمۡ أَجَلٗا لَّا رَيۡبَ فِيهِ فَأَبَى ٱلظَّٰلِمُونَ إِلَّا كُفُورٗا ٩٩
قُل لَّوۡ أَنتُمۡ تَمۡلِكُونَ خَزَآئِنَ رَحۡمَةِ رَبِّيٓ إِذٗا لَّأَمۡسَكۡتُمۡ خَشۡيَةَ
ٱلۡإِنفَاقِۚ وَكَانَ ٱلۡإِنسَٰنُ قَتُورٗا ١٠٠ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَىٰ تِسۡعَ
ءَايَٰتِۭ بَيِّنَٰتٖۖ فَسۡـَٔلۡ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ إِذۡ جَآءَهُمۡ فَقَالَ لَهُۥ فِرۡعَوۡنُ
إِنِّي لَأَظُنُّكَ يَٰمُوسَىٰ مَسۡحُورٗا ١٠١ قَالَ لَقَدۡ عَلِمۡتَ مَآ أَنزَلَ
هَٰٓؤُلَآءِ إِلَّا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ بَصَآئِرَ وَإِنِّي لَأَظُنُّكَ
يَٰفِرۡعَوۡنُ مَثۡبُورٗا ١٠٢ فَأَرَادَ أَن يَسۡتَفِزَّهُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ
فَأَغۡرَقۡنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ جَمِيعٗا ١٠٣ وَقُلۡنَا مِنۢ بَعۡدِهِۦ لِبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ
ٱسۡكُنُواْ ٱلۡأَرۡضَ فَإِذَا جَآءَ وَعۡدُ ٱلۡأٓخِرَةِ جِئۡنَا بِكُمۡ لَفِيفٗا ١٠٤

الحزب ٣٠

وبالحق أنزلناه ٢٩٢

## ڕێنمایی و گومرایی بەدەستیی خوایە:

﴿[٩٧] ومن يهد الله فهو المهتد﴾ هەرکەسێك خوا ڕێنمایی بکاو، شایستەشبێت بۆبڕواهێنان و ڕێنمایی، دیارە ئەوکەسەیە شارەزاو، لەسەر ڕێگەی ڕاست و دروست ﴿ومن يضلل﴾ هەرکەسێکیش گومڕاو سەرگەردان بکات بەهۆی لاساریی خۆیەوە ﴿فلن تجد لهم أولياء من دونه﴾ ئیتر بێجگە لەڕێی ئەو (خوا) بالادەستەوە، ناتوانی

پشتیوانیان بۆ دەست بخەیت و، ڕزگاریان بکەیت لەسزا، لە ئایەتێکی دیکەدا دەفەرموێ: (من یهدالله فهو المهتد ومن یضلل فلن تجد له ولیا مرشدا) ﴿ونحشرهم یوم القیامة علی وجوههم عمیا وبکما وصما﴾ لەڕۆژی قیامەتیشدا بەدەمەو ڕوویی و کوێری و لاڵی و کەڕی هەموو کۆ دەکەینەوەو حەشەریان دەکەین، چوون لەدنیادا هەقیان نەبیستووە، هەقیان نەدیتووە لەوێش هەرنابیناوکەڕو لاڵ دەبن. لە پێغەمبەریان ﷺ پرسی: چۆن خەڵکی بەڕوودا حەشەر دەکرێت؟فەرمووی: (الذی أمشاهم علی أرجلهم، قادر علی أن یُمشیَهم علی وجوههم). ﴿مأواهم جهنم﴾ جێ و ڕێیان دۆزەخە ﴿کلما خبت زدناهم سعیرا﴾ هەر جارێکیش بڵێسەی ئاگرەکە کەم و کز بوو، دووبارە نیلی دەدین و هەڵی دەگیرسێنینەوە و زیاتری دەکەین بۆیان، وەکو دەفەرموێ: (فذوقوا فلن نزیدکم إلا عذابا)﴿[٩٨] ذلك جزاؤهم بأنهم کفروا بآیاتنا﴾ با ئەو سزاو تۆڵەیە جەزایان بێت، چونکە بڕوایان بە ئایەت و بەڵگەکانی ئێمە نەبوو ﴿وقالوا إذا کنا عظاما ورفاتا﴾ دەیانگوت: باشە! ئەگەر ئێمە بووینە ئێسکە ڕزیوو پارچە پارچەو پەڕاگەندە بووین و ڕزاین؟ ﴿إنا لمبعوثون خلقا جدیدا﴾ ئەرێ دەکرێ‌جارێکی تر سەرلەنوێ زیندوو بکرێینەوە؟ ﴿[٩٩] أولم یروا أن الله الذی خلق السموات والأرض قادر علی أن یخلق مثلهم﴾ ئاخۆ نابینن و تێ نافیکرێن کە هەر ئەو خوایەی ئاسمانەکان و زەویی دروستکردووە.. هەرئەویش بەتوانایەو دەسەڵاتی هەیە بۆ جارێکی تر دروستیان بکاتەوە، خۆ بۆ یەکەمجار بێناغە و بێبنەمایەك بەدییهێناون، دڵنیابن ئێستا زۆر بەئاسانتر دەتوانێ دروستیان بکاتەوە، لە جێگایەکی تردا هەر بۆ سەلمانی دەسەڵات و توانایی خوای گەورە دەفەرموێ: (لخلق السموات والأرض أکبر من خلق الناس..). ﴿وجعل لهم أجلا لا ریب فیه﴾ دیارە کە بۆ زیندوو بوونەوەو گەڕانەوەیان بۆلای خۆمان، ڕۆژو ماوەیەکی تایبەتییمان بۆ دیاریکردوون و، هیچ گومانێکیش لەهاتنی ئەوڕۆژەدا نییەو، بەڕێك و پێکی هەموویشیان لەوکاتەدا زیندوو دەکرێنەوە،وەکو لەئایەتێکی دیکەدا دەفەرموێ: (ومانؤخره إلا لأجل معدود). ﴿فأبی الظالمون إلا کفورا﴾ کەچی لەگەڵ ئەو گشت بەڵگانەدا،هێشتا ستەمکارو بێ بڕوایان، هەر نکوڵی و ململانێ دەکەن!

**مرۆ ڕژدو چنۆکە:**

﴿[١٠٠] قل لو انتم تملکون خزائن رحمة ربی﴾ پێیان بڵێ: ئەگەر ئێوە خاوەنی گەنجینەکانی ئەو گشت ڕزق و ڕۆزیی و میهرەبانییەی پەروەردگارم بوونایە ﴿إذا لأمسکتم خشیة الإنفاق﴾ ئەوکاتە لەبەرچاو چنۆکیی و ترسی هەژاریی خۆتان،ڕژدیتان دەکردو نەتان دەبەخشیی و بەشی کەستان نەدەدا جا ئیتر داوای چی لەپەیامبەردەکەن‌ﷺ؟! ﴿وکان الإنسان قتورا﴾ ئەوەش جێگەی سەر سوڕمان نییە، چونکە ئادەمیزاد هەر بەسروشت چرووك و بەخیل و بەرچاو تەنگە، بۆیە لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ (أم لهم نصیب من الملك فإذا لایؤتون الناس نقیرا). سەخاوەت و بەخششی خوا بێ‌سنوورو بێ وێنەیە، وەکو لەم فەرموودە(متفق علیه)دا هاتووە: ((یدالله مَلأی لایَغیضها نفقةً سحاءُ اللیلَ والنهارَ، أرأیتم ماانفق منذ خلق السماء والأرض،فإنه لم یَغِضْ ما فی یمینه)) واتە:هەمیشە دەستی بەخششی خوا پڕە، قەت بە بەخشین کەم ناکا، بە شەوو بە ڕۆژ هەر دەبەخشێ، ئاخۆ نابینن کە هەر لەو شەوو ڕۆژەوە ئاسمانەکان و زەویی دروستکردوون هەر دەبەخشێ و دەستیشی خاڵی نابێتەوە؟ (متفق علیه).

**نۆ بەڵگەکەی مووسا ؑ:**

﴿[١٠١] ولقد آتینا موسی تسع آیات بینات﴾ بێ سۆ هەرکە (مووسا)مان ناردە لای فیرعەون (٩) ئایەت و بەڵگەی ئاشکراو زۆر ڕوونمان دایە: (عەصاکەی دەستیی، دەستەکە نوورانییەکەی خۆی، تۆفان، کوللە، سوون، بۆق،

خوێن، لەت بوونی دەریا، گرانییو قات و قڕیی؛ هەر یەك لەمانە لەسوورەی (ئەعراف)دا باسكراون ﴿فأسأل بنى إسرائيل إذ جاءهم﴾ حەز دەكەیت (لەبەنی ئیسرائیل)ی سەردەمی خۆت بپرسە: ئەوەدەمەكە موسا هاتە لایان، چییان دەوت؟ لە ئایەتێكی تردا هاتووە: (فاستكبروا وكانوا قوما مجرمين). یان دەفەرموێ: (وجحدوا بها واستيقنتها انفسهم ظلما وعلوا). ﴿فقال له فرعون إنى لأظنك يا موسى مسحورا﴾ كەچی كاتێ موسا بەو هەموو بەڵگانەوە گەیشت، فیرعەون پێیگوت: ئەی موسا! من پێم وایە كە بەراستیی تۆ سیحر لێكراوو شێتیت، بۆیە ئەو قسانە دەكەیت ﴿١٠٢ قال لقد علمت ما انزل هؤلاء﴾ موسا وتی: ئەی فیرعەون! بەڕاستیی تۆ چاك دەزانی كە ئەو (٩) بەڵگەو ئایەتانە لەخۆیانەوە نەهاتوون ﴿إلا رب السموات والأرض﴾ بەڵكو هەر پەروەردگاری ئاسمانەكان و زەوی ناردوونیی ﴿بصائر﴾ تابینە بەرچاو روونكەرەوە بۆ ڕاستیی و دروستیی پەیامبەرییەتیم ﴿وإنى لأظنك يا فرعون مثبورا﴾ فیرعەون! من دڵنیام كە تۆ لە خەڵكە نەفام و تیاچووو نەحلەتییەكانی" ئەگەر هەر ئەوە عەقڵت بێت ﴿١٠٣ فأراد أن يستفزهم من الأرض﴾ ئینجا فیرعەون بەتەواوی لێ بڕاو ویستی لەوسەر زەوییەی (میسر)ـە موساو هۆزەكەی دەر بەدەر بكا، لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێ: (وإن كادوا ليستفزونك من الأرض ليخرجوك منها). ﴿فأغرقناه ومن معه جميعا﴾ ئینجا ئێمەش دەستی خۆمانمان پێش خست و نوقمی دەریامان كرد، بە خۆی و، بە ئەوانەوە لەگەڵیا بوون ﴿١٠٤ وقلنا من بعده لبنى إسرائيل اسكنوا الأرض﴾ وەلەپاش لەناوبردنی فیرعەون خۆی و دام و دەزگاكەی، بە(بەنی ئیسرائیل)مان گوت: ئێوەلەم سەرزەوییەی (شام) و (میسر)دا نیشتەجێ ببن لەجێی ئەواندا ﴿فإذا جاء وعد الآخرة جئنا بكم لفيفا﴾ ئینجاكە كاتی رۆژی قیامەت هات، ئەوسا دەستە دەستەو كۆمەڵ كۆمەڵ چاك و خراپتان كۆ دەكەینەوەو بەرەو دادگای خوای گەورە دێن ﴿١٠٥ وبالحق انزلناه وبالحق نزل﴾ ئێمە ئەم (قورئان)ـە مان لەسەر بنچینەی ڕاستیی و دروستیی ناردووەو، هەر بۆچەسپاندنی حەق و ڕاستیش هاتۆتە خوارێ، واتە: وەكو خۆی هەقە، بۆ سەر خستنی هەقیش هاتووە، كەوابوو توند باوەشیی پیا بكەن و، هەرگیز بەری مەدەن ﴿وما أرسلناك إلا مبشرا ونذيرا﴾ خۆ تیشمان ئەی موحەممەد! ﷺ تەنها بەمژدەدەرو ترسێنەر رەوانە كردووە، واتە: هەر كسێك گوێ رایەڵت بێت مزگێنی بەهەشتی بدەرێ، هەر كەسیش لاسارو لار بێت بەدۆزەخ بیترسێنە.

## قورئانمان بەش بەش نارد:

﴿١٠٦ وقرآنا فرقناه لتقرأه على الناس على مكث﴾ ئەو قورئانەشمان بەشبەش بۆ ناردوی،هە تا بەرە بەرەو بەشێنەیی و لەسەرخۆ بۆ خەڵكیبخوێنیتەوە. بەڵێ.. قورئان بەتێكڕاو بەیەكجار لە(لوح المحفوظ)ـەوە نێردرایە(بيت العزة) لەم ئاسمانەی خۆمانەدا، ئەوجا لەشەوی قەدردادەستی پێكردو هاتەخوارێ، بەڵام بۆ ماوەی (٢٣)ساڵ ئەوجا كۆتاییهات،وەكو دەفەرموێ:﴿ونزلناه تنزيلا﴾ بەشبەش و بڕگە بڕگەو بەپێیپێویست وردە وردە دامان بەزاند، چونكە ئەگەر بڕیارو فەرمانە فەرزەكان هەمووییەكەوە بوونایە، لەوانەبوو بەئاسانی قەبووڵ نەكرابا.

## گەلانی بەر لەتۆش باوەڕیان بە قورئان هەبوو:

﴿١٠٧ قل آمنوا به أولا تؤمنوا﴾ بەو بێ بڕوایانەی پێشنیازی مۆجیزەیان لێدەكردی بڵێ: بڕوا بەو قورئانە بهێنن، یان بڕوای پێ نەهێنن، بایەخ وبەهای كەم ناكاو وەك خۆی دەمێنێتەوە ﴿إن الذين أوتوا العلم من قبله﴾ بەراستیی ئەوانەی لەپێش ئەم (قورئان)ـەوە زانست و زانیارییان پێدراوە،واتە:خاوەن نامەكان، پیاوە صالح و چاكەكانیان چاك دەزانن كە ئەم قورئانە لەهەمان سەرچاوەوەهاتووە كتێبەكانی ئەوانی لێوە هاتووە ﴿إذا يتلى عليهم يخرون للأذقان سجدا﴾ بۆیە هەر كات بۆیان دەخوێنرێتەوە، بەچەناكەوبەڕوودادەكەونە زەویی بۆ كڕنووش

بردن وسوپاسی خوا،چونکه تەمەنی دانێ و گەیەشتنە سەردەمی ئەو پێغەمبەرەو بەدیداری شادبوون، کەوابووئێتر ئێوە ئەی قورەیش و دەورو بەرا‌س کڕنووش بەرن یان نە، گرنگ نییە ﴿[١٠٨] ویقولون سبحان ربنا إن كان وعد ربنا لمفعولا﴾ بۆیە دەڵێن: پاکیی و خاوێنی هەر شایستەی پەروەردگاری ئێمەیەو، بێ‌سۆیش بەڵێنی پەروەردگارمان هەمیشە لەکاتی خۆیدا هاتۆتە دی، لەو کتێبانەدا بۆ ئێمە هاتن، ئەو مژدەیە دابوو، وا ئەمڕۆ جێبە جێ بوو ﴿[١٠٩] ویخرون للأذقان یبكون﴾ وەبۆ سوپاسی خوا بەچەناکەو دەمەو ڕوودەکەون و کڕنووش دەبەن "وە لەترسی خوادا بەکوڵ دەگرین و فرمێسك لەچاویاندێ ﴿ویزیدهم خشوعا﴾ وهەتا دێ، جار لەدوای جاریش ئەو قورئانە ملکەچییان زیاد دەکاو، پتر تەسلیمی ئەمری خوا دەبن.

## ناوە پیرۆزەکانی خوا:

﴿[١١٠] قل ادعوا الله أو ادعوا الرحمن﴾ پێیان بڵێ: لەنزاو دوعاکانتاندا ئەر ناوی پیرۆزی (الله) بەرن" وەیان هاوار بە هەر یەکێ لەسیفەتە پیرۆزەکانی ئەو بکەن، بۆ نموونە: وەکو (الرحمن) هەر یەکەو قەبوولە ﴿أیاما تدعوا فله الأسماء الحسنى﴾ جا ئێوەش بەهەر ناوو سیفەتێکەوە، لەو ناوو سیفەتانە بۆخۆی دیارییکردون دەتوانن داوای لێ بکەن و هاواری بۆ بەرن، چونکە ناوی پیرۆزی خوا زۆرن" ئەم دوانەیش(الله، الرحمن) هەر لەوانن، وەکو لەئایەتێکیتردا دەفەرموێ: (هوالله الذی لاإله إلا هو عالم الغیب والشهادة هوالرحمن الرحیم.. له الأسماء الحسنى یسبح له مافی السموات والأرض وهو العزیز الحكیم). جارێکیان کافرو بێ‌بڕواکان گوێیان لەپەیامبەرەوە بوو ﷺ کە لەنزاو دوعاکانییدا ئەیفەرموو: (یا الله! یا رحمان!)، کەچی گوتیان: سەیرە! موحەممەد لەولاوە بۆ یەکتا پەرستیی بانگمان دەکات، لەم لایشەوە لەدوو خوا هاوار دەکات، جا خوایش ئەم ئایەتەی: (قل ادعوا الله..)ی ناردە خوارێ،

سەبارەت بە ناوە جوانەکانی خوا دەکرێ‌بگەڕێیتەوە بۆئایەتی/١٨٠ ی سوورەتی(ئەعراف)، چونکە لەوێ ئەم باسە زیاتر قسەی‌لێکراوە ﴿ولا تجهر بصلاتك ولا تخافت بها﴾ لەکاتی خوێندنی قورئاندا بەتایبەت لەنوێژەکانتدا دەنگ بەرز مەکەوەو مەقیڕێنە تا قوورەیش نەبیستن و جنێو نەدەن بە دینەکەت" زۆریش هێواش و نزمی مەکە، بەڵکولەسەر خۆبەو بەشێوەیەك بیخوێنە کە ئەوانە لەپشتەوەن گوێیان لێ بێت ﴿وابتغ بین ذلك سبیلا﴾ لەنێوان ئەو دوو حاڵەتەدا ڕێگایەکی مام ناوەندیی و لەبار بۆ خۆت ڕەچاو بکە" قورەیش کاتێ گوێیان لەپەیامبەرەوە دەبوو قورئانی دەخوێند ئەوەندە کەللە ڕەق و سەر سەخت بوون، جنێویان هەم بەخۆی و، هەم بەخواکەشی دەدا، جا بۆ ئەوە ئەو کارە نەگریسەیە نەکن، ئەو ئایەتەی (ولا تجهر بصلاتك..) وەك ئیمامی (بوخاریی) و (موسلیم) دەڵێن هاتە خوارێ. ﴿[١١١] وقل الحمد لله الذی لم یتخذ ولدا﴾ بڵێ: سوپاس و ستایش هەر بۆ ئەو خوایە کە کەسی نەکردووە

الجزء الخامس عشر — سورة الإسراء

وبالحق أنزلنه وبالحق نزل وما أرسلنك إلا مبشرا ونذيرا ﴿١٠٥﴾
وقرءانا فرقنه لتقرأه على الناس على مكث ونزلنه تنزيلا ﴿١٠٦﴾
قل ءامنوا به أو لا تؤمنوا إن الذين أوتوا العلم من قبله إذا يتلى
عليهم يخرون للأذقان سجدا ﴿١٠٧﴾ ويقولون سبحن ربنا إن كان
وعد ربنا لمفعولا ﴿١٠٨﴾ ويخرون للأذقان يبكون ويزيدهم
خشوعا ۩ ﴿١٠٩﴾ قل ادعوا الله أو ادعوا الرحمن أيا ما تدعوا فله
الأسماء الحسنى ولا تجهر بصلاتك ولا تخافت بها وابتغ
بين ذلك سبيلا ﴿١١٠﴾ وقل الحمد لله الذى لم يتخذ ولدا ولم يكن
له شريك فى الملك ولم يكن له ولى من الذل وكبره تكبيرا ﴿١١١﴾

سورة الكهف — ترتيبها ١٨ — آياتها ١١٠

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله الذى أنزل على عبده الكتب ولم يجعل له عوجا ﴿١﴾
قيما لينذر بأسا شديدا من لدنه ويبشر المؤمنين الذين
يعملون الصلحت أن لهم أجرا حسنا ﴿٢﴾ مكثين
فيه أبدا ﴿٣﴾ وينذر الذين قالوا اتخذ الله ولدا ﴿٤﴾

بەکوڕی خۆی و، منداڵ و کوڕیشی هەر نییە ﴿ولم یكن له شريك في الملك﴾ وە لە دەسەڵات و مۆلکییدا هیچ هاوبەش و هاوتایەکیشی نەبووەو نییە﴿ولم یكن له ولي من الذل﴾ یارو یاوەریشی بۆ خۆی نەگرتووەو، لە بەر بی دەسەڵات و بێ تواناییشی، داوای هاوکاریشی لەکەس نەکردووە ﴿وكبره تكبيرا﴾ تۆیش هەمیشە (الله أكبر) بڵێ و، خوا زۆر بەگەورەو گران بزانە، وە هەموو ناووسیفەتێکی بەرزوبڵەندو بەشکۆی بۆ بڵێ.

زۆر زۆر پێدەزانم کە خوای گەورە پشتیوانی لێکردم بۆ نووسین و تەواوکردنی تەفسیری سوورەتی (ئیسراء)، بۆیە هەردەم بەردەوام دەڵێم: الحمد لله رب العالمین والصلاة والسلام علی رسوله محمد الذی أسری به من المسجد الحرام إلی المسجد الأقصی، وعلی آله وأصحابه وکل من والاه.

***   ***   ***

## ١٨- سوورەتی ( کەهف )ـە

## مەککەییيەو ( ١١٠ )ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتە یەکێکە لەو پێنج سوورەتانە کە سەرەتاکەیان بە (الحمدلله) دەست پێدەکەن، وەکو: سوورەتی (فاتیحە، ئەنعام، کەهف، سەبەء، فاطر).. هەمووشیان ستایشی خوای دلۆڤان پێشکەش ئەکەن و ددان بەبێخەوشیی و پاك و خاوێنی ئەودا دەنێن.

* ئەم سوورەتە بۆ چەسپاندنی بیروباوەڕو بڕوا بەگەورەیی خوا، سێ داستان و سەر گوزەشتە دەگێڕێتەوە..

یەکەمیان: داستانی (أصحاب الکهف).. کە وانەو دەرسی فیداکاریی و لەخۆبوردنە لەپێناوی بیرو باوەڕدا.. هیجرەت و بەجێهێشتنی ئەو کۆمەڵە لاوە باوەڕ ئەستوورو قایمە، وڵات بەجێ دێڵن و لە دەوڵەت و دەسەڵاتی ئەو سەردەمە خۆقاچاغ دەکەن و ژیانی شاخ و داخ و ئەشکەوت هەڵدەبژێرن.. بەڕاستیی کاری وا ئەوپەڕی قارەمانێتیی و، جوامێرییە. دووەم: داستانی (خدر) و (موسا) یە (علیهما السلام) بەوشێوە کە مووسا ڕێگەی خۆبەکەم زانین و (تواضع)ی گرتە بەر لە پێناوی فێربوونی زانست و زانیارییدا.. پاشان موسا هەر لەو نێوانەدا بەسەر ئەو شتە غەیب و نادیارانەدا کە(خدر) دەیزانین ئاگاداربوو. سێ یەم: داستانەکەی (زیلقەرنەین)ـە، کە بەڕاستی هێماو نیشانەی سەرکەوتنی صەڵاحەت و دادگەری وڕاستیی و تەقوایە، هەر لەبەر ئەوەش بوو بەشێکی گەورەی خۆر هەڵات و خۆرئاوای ئازاد کردو، پاشان ناوچەکانی تر خۆیان ئامادە دەکردبۆ پێشوازی کردن لە سوپا رزگارکەرەکەی.

ئەم سوورەتە لەگەڵ ئەوەشدا ئەو سێ داستانە دەگێڕێتەوە، سێ نموونەی تری زیندوو وڕاست و واقعیش بەیان دەکات، تا هەموو کەسێك بزانێت هەق و ڕاستیی پەیوەست بە دەسەڵات و سامانی زۆرەوە نییە، بەڵکو تەنها بە بیرو باوەڕی پتەو بەخوایە, سێ نموونە کەش ئەمانەن: یەکەم: دەوڵەمەندێکی بافیشکارو خۆهەڵکێش و فریو خواردوو بە سامانەکەی. ئینجا هەژارێکی سەربەرزو شانازیکەر بە ئیمانو باوەڕەکەیەوە، پاشان دەرەنجامیان. دووەم: ژیانی ئەم دونیایەو ئەنجامەکەی. سێ یەم: نموونەی مرۆڤی خۆبە زلزان و (متکبر).. وەکو (ئیبلیس)، ئەوەبوو چۆن ئیبای کرد سوژدە بۆ ئادەم ﷺ بەرێ، دەرەنجام لە ڕەحمەت و میهرەبانی خوا بێ بەشکرا.

لە فەزڵ و گەورەیی سوورەتی (کەهف). دا ئەم فەرموودانە هاتوون:

١- پێشەوا (ئەحمەد) لە (ئەبوودەرداو ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((من حفظ عشر آيات من أول سورة الكهف عصم من الدجال)) واتە: هەرکەسێ (١٠) ئایەتەکەی سەرەتای سوورەتی (کەهف) لەبەر بکا، لە دەجال دەپارێزرێ.

٢- هەر لە ئەبوودەرداوە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((من قرأ العشر الأواخر من سورة الكهف عصم من فتنة الدجال)) واتە: لەبەرکردنی (١٠) ئایەتی کۆتایی ئەم سوورەتی (کەهف)ـە دەبێتە مایەی پاراستن لە دەجال.

٣- ئیبن عومەر (رضى الله عنهما) لە پێغەمبەرەوەﷺ دەڵێ: ((من قرأ سورة الكهف في يوم الجمعة سطع له نور من تحت قدمه إلى عنان السماء، يضئ له يوم القيامة، وغفر له ما بين الجمعتين)). واتە: هەرکەسێك لە رۆژی هەینییدا سوورەتی (کەهف)ـی خوێند، نورێك لە ژێر پێیەوە دەردەچێ بۆ ئاسمان و، لەرۆژی قیامەتیشدا رێی پێدەردەکاو، دەشبێتە کەفارەتی گوناهی نێوانی ئەم جومعە بۆئەو جومعەکەی تر.

**قورئان بەڵگەی راستی پێغەمبەرە:**

تەفسیری (تەبەری) و (سیرەی ئیبن هیشام) دەڵێن: قورەیش دووکەس دەنێرنە لای جوولەکەکان لە راستیی و ناراستیی پێغەمبەر ﷺ بپرسن، چونکە ئەوان (تەورات)یان هەیەو دەزانن کەئەگەر موحەممەد ﷺ راست بێت، ئەوانیش پێیان دەڵێن: بچن ئەم سێ پرسیارەی لێبکەن، جائەگەر وەڵامەکەی راست بوو، دیارە کە پێغەمبەری خوایە.

یەکەم: یارانی (غارو رەقیم) کێ بوون؟

دووەم: ئەو پیاوە کێ بوو توانی خۆرهەڵات و خۆرئاوا بگەڕێ؟

سێیەم: (ڕۆح) چییەو چی لێدەزانیت؟ ئەمیش بێ (إن شاءالله) فەرمووی: سبەینێ وەڵامتان دەدەمەوە! بەڵام لەبەرئەوە کە(إن شاءالله)ی نەکرد، حیکمەتیخوا وابوویازدە رۆژ وەحیی دواکەوت و، قورەیش لێیان کردە هەراو هۆسە، خۆیشی بۆ دواکەوتنی وەحیەکە زۆر بێتاقەت بوو، پاشان(جوبریل) ئەم سوورەتی (کەهف)ـەی بۆ هێناو بەتێرو تەسەلی وەڵامی دانەوەوفەرمووی: ﴿بسم الله الرحمن الرحيم * [١] الحمد لله الذى أنزل على عبده الكتاب﴾ هەموو سوپاس و ستایش و سوپاسگوزارییەکی شیاو هەر بۆ ئەو خوایە کە: ئەم قورئانەی بۆ سەر بەندەی خۆی موحەممەد ﷺ ناردەخوارێ ﴿ولم يجعل له عوجا﴾ وهیچ جۆرە کەم و کوڕی و خواریی و ناتەواوییەکیشی تێنەخستووە، نە لە بێژەو وشەکانییدا، وەنەلە مانا ومەبەستەکانییدا ﴿[٢] قيما﴾ کتێبێکی زۆر ڕاست و پایە داروبەنرخە، وەلە هیچ ڕوویەکەوە کەچی تێدا نیە ﴿لينذر بأسا شديدا من لدنه﴾ تا بەدکاران و کافران لەسزای توندی خۆی بێدار بکاتەوەو بترسێنێ ﴿ويبشر المؤمنين الذين يعملون الصلحات﴾ بەو بڕوادارانەش کارو کردەوەی چاك ئەنجام ئەدەن مژدەو مزگێنی بدا ﴿أن لهم أجرا حسنا﴾ کە بێگومان مزەو پاداشتێکی زۆر چاکیان بۆهەیە، بەهەشت و ڕەزامەندیی وخۆشنوودی خوای گەورە ﴿[٣] ماكثين فيه أبدا﴾ بەهەتاهەتایی و هەمیشەش لەوپاداشەدان و، هەر دەمێننەوەو هەرگیز کۆتایی نایەت و نابڕێتەوە ﴿[٤] وينذر الذين قالوا اتخذ الله ولدا﴾ بەتایبەتی ئەوانە بترسێنێ کە دەڵێن: خوا کوڕی بۆ خۆی داناوە! ﴿[٥] ما لهم به من علم ولا لآبائهم﴾ کە ئەو قسەش دەکەن،نەخۆیان شتێکیان لێزانیوەو، نەباوو باپیرانیشیان , هیچ کامیان زانیارییەکیان لەوبارەوە نییە ﴿كبرت كلمة تخرج من أفواههم﴾ ئای چ قسەو وشەیەکی گەورەو ناقۆڵایان لە دەم دەرچوو ﴿إن يقولون إلاكذبا﴾ درۆو دەلەسە نەبێ هیچ شتێکی تر ناڵێن و نازانن! ئەگینە خوا کوڕو منداڵی لە کوێ بوو؟

**بۆ موشریکان خەم مەخۆ:**

﴿[٦] فلعلك باخع نفسك على آثارهم إن لم يؤمنوا بهذا الحديث أسفا﴾ لەوانەیە تۆیش ئەی پێغەمبەر! ﷺ لەخەم و خەفەتی ئەوانەدا باوەڕ بەم قورئانە ناکەن , خۆت لە ناو ببەیت و تیابچیت، واتە: نابێ وابکەیت، چونکە تۆ تەنها ڕاگەیاندنت لە سەرە، ئیتر کێ باوەڕ دێنێت، کێش ناهێنێت، حیسابی لە سەر تۆ نییە , وەکو لە چەندسوورەتێکی تردا ئەوەی دووپات کردۆتەوەو دەفەرموێ: (فلا تذهب نفسك عليهم حسرات..) یان دەفەرموێ: (لعلك باخع نفسك الا يكونوا مؤمنين).﴿[٧] إنا جعلنا ماعلى الأرض زينة لها﴾ هەرچی لەڕووی ئەم زەوییەدایە ئێمە کردومانە مایەی جوانیی و ڕازاندنەوەبۆی ودەرەنجام هەموویشی تیا دەچێت ﴿لنبلوهم أيهم أحسن عملا﴾بۆ ئەوە تاقیيان بکەینەوەو دەرکەوێ کامیان کارو کردەوەی جوانترو باشتردەکات؟ واتە:

ئـــەم دنیایـــە جێگـــای تاقییکردنـــەوەی مرۆڤـــە، لـــەم فەرموودەیەشـدا هـاتووەو دەفـەرموێ: ((إن الـدنيا حلـوة خضرة،وإن الله مستخلفكم فيها،فناظر ماذا تعملون، فاتقوا الدنيا، واتقوا النساء،فإن أول فتنة بنى إسرائيل كانت من النساء)) پێشەوا ئەحمەد. ﴿[٨] وانا لجاعلون ما عليها صعيدا جرزا﴾ بێگومان ئێمەئەوەی لەسەر ئەم زەویەدایە تەختی دەکەین و دەیکەینە خاك وخوڵێکی وشك و بێ گژو گیاو، هیچ سەوزایی و، خێروبێرێکی تیا ناهێڵین، کەواتە تۆیش ئەی پێغەمبەر! ﷺ هیچ خەم و حەسرەتیان بۆ مەخۆ، چونکە هەموویان دەگەڕێنەوە لای خۆمان. ئەوانە دنیا چەواشەی کردبوون، نکووڵی زیندوو بوونەوەیان دەکرد! کەچی گەلێ ڕووداوی وا هەیە هەرلەدنیادا ئەگەر ژیرانە تەماشا بکرێن، دەردەکەوێت کە: ژینێکیتر رادەگەیەنێت، ئەگەرچی پاش ماوەیەکی زۆریش بێت، وەکو داستانەکەی یارانی ئەشکەوت (أصحاب الكهف). ڕاڤەکەرانی قورئان دەگێڕنەوە کە لەدوای سەردەمی (عیسا)دا ؑ لەوڵاتی (ڕۆم)دا پاشایەکی ستەمکاربە ناوی (دەقیانووس)ـەوە هە بووە و خەڵکی بۆبت پەرستیی بانگ دەکرد، جاهەر موسڵمانێك سوژدەی بۆ نەبردبا دەیکوشت!! تاوای لێهات ئەو کارە بەلای موسڵمانانەوە زۆر گەورەو سەخت و گران بوو، بەتایبەتی لای کۆمەڵی لاوان (فیتیە) شتێکی زۆر خراپ و کارێکی زۆر ناپەسەند بوو، پاشایش ناردی بەدوایانداو ئەوانیش هاتن، پاشان هەڕەشەی کوشتنی لێکردن ئەگەر کڕنووشی بۆ نەبەن!! ئەوسا ئەمانیش ڕووبەڕووی وەستان و بۆ دوایی هەڵهاتن.

الجزء الخامس عشر | سورة الكهف

مَّا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ وَلَا لِآبَائِهِمْ كَبُرَتْ كَلِمَةً تَخْرُجُ مِنْ
أَفْوَاهِهِمْ إِن يَقُولُونَ إِلَّا كَذِبًا ﴿٥﴾ فَلَعَلَّكَ بَاخِعٌ نَّفْسَكَ
عَلَىٰٓ ءَاثَارِهِمْ إِن لَّمْ يُؤْمِنُوا۟ بِهَٰذَا ٱلْحَدِيثِ أَسَفًا ﴿٦﴾ إِنَّا
جَعَلْنَا مَا عَلَى ٱلْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا
﴿٧﴾ وَإِنَّا لَجَٰعِلُونَ مَا عَلَيْهَا صَعِيدًا جُرُزًا ﴿٨﴾ أَمْ حَسِبْتَ
أَنَّ أَصْحَٰبَ ٱلْكَهْفِ وَٱلرَّقِيمِ كَانُوا۟ مِنْ ءَايَٰتِنَا عَجَبًا ﴿٩﴾
إِذْ أَوَى ٱلْفِتْيَةُ إِلَى ٱلْكَهْفِ فَقَالُوا۟ رَبَّنَآ ءَاتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً
وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا ﴿١٠﴾ فَضَرَبْنَا عَلَىٰٓ ءَاذَانِهِمْ فِى
ٱلْكَهْفِ سِنِينَ عَدَدًا ﴿١١﴾ ثُمَّ بَعَثْنَٰهُمْ لِنَعْلَمَ أَىُّ ٱلْحِزْبَيْنِ
أَحْصَىٰ لِمَا لَبِثُوٓا۟ أَمَدًا ﴿١٢﴾ نَّحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ نَبَأَهُم بِٱلْحَقِّ
إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ ءَامَنُوا۟ بِرَبِّهِمْ وَزِدْنَٰهُمْ هُدًى ﴿١٣﴾ وَرَبَطْنَا
عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ إِذْ قَامُوا۟ فَقَالُوا۟ رَبُّنَا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ
لَن نَّدْعُوَا۟ مِن دُونِهِۦٓ إِلَٰهًا لَّقَدْ قُلْنَآ إِذًا شَطَطًا ﴿١٤﴾ هَٰٓؤُلَآءِ
قَوْمُنَا ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً لَّوْلَا يَأْتُونَ عَلَيْهِم
بِسُلْطَٰنٍۭ بَيِّنٍ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ﴿١٥﴾

٢٩٤ | وَإِذِ ٱعْتَزَلْتُمُوهُمْ

**سەرگورشتەی یارانی ئەشکەوت:**

﴿[٩] أم حسبت أن أصحاب الكهف والرقيم كانوا من آياتنا عجبا﴾ ئاخۆ تۆش پێت وایە کە: یارانی ئەشکەوت (أصحاب الكهف) و (ڕقیم) لەناو بەڵگەکانی ئێمە دا شتێکی سەیرو سەمەرەیە وەکو ئەوان پێیان وابوو..؟!

نەخێر. ئەوە بۆ دەسەڵات وتوانایی ئێمە شتێ نییە جێگەی سەر سوڕمان بێت، چونکە لە بوونەوەردا گەورەترو سەرسوڕهێنەرترمان- وەك ئاسمان وزەویی- هەیە.

(ڕەقیم): وەکو (ئیبن عەباس) دەڵێ: ئەو تەتەڵەوپارچە بەردەیە کە نێوی یارانی ئەشکەوتەکەی لەسەر نووسرابوویەوە پاش مردنیان ﴿[10] إذ اوى الفتية إلى الكهف﴾ کاتێ کە لاوەکان (حەوت کوڕە گەنجەکە) پەنایان بۆ ئەشکەوتەکە برد و،لە دەست ئەو ستەمکارانەی سەردەمە - لەبەر فەرمانی خوا- هەڵهاتن و کڕنووشیان بۆ بتەکانیان نەبرد و سەریان بۆ پاشا دانەنواند ﴿فقالوا ربنا آتنا من لدنك رحمة﴾ وتیان: پەروەردگاری ئێمە! لە لایەن خۆتەوە بەر ڕەحمەت و میهرەبانییەکی فراوان و گەورەمان بخە، هێزو توانامان بدە لەسەر هەق ڕاوەستین ﴿وهيئ لنا من امرنا رشدا﴾ ڕێی سەرفرازیی و ڕزگاریمان بۆ سازبدە لەم ئەشکەوتەدا،، چاوی ئەو یاخییبوانە لە ئاستمان کوێر بکە، بەرەو کارێك بمانبەکە جێگەی ڕەزامەندی خۆت و، مایەی لێبوردنت بێت، لە فەرموودەیەکدا هاتووەو دەفەرموێ: ((وما قضيت لنا من قضاء فاجعل عاقبته رشدا)) پێشەوا ئەحمەد.﴿[11] فضربنا على اذانهم فى الكهف سنين عددا﴾ بەڵێ هەڵهاتن و ڕۆیشتنە ئەشکەوتەکەوە، ئینجا ئێمەیش نزایانمان گیرا کرد و، بۆ چەند ساڵ وزەمانێك پەردەی(خەو) مان بەسەر گوێیاندا کێشا و، لە خەو ڕاچوون و ئەو ماوە زۆرەیە خەویان لێکەوت و، هیچ دەنگ و سەدایەکیش خەبەری نەکردنەوە ﴿[12] ثم بعثناهم﴾ پاشان دوای ماوەیەکی دوورو درێژ هەڵمان ساندن و خەبەرمان کردنەوە، هەتا یەکێکیان بچێت شتێکیان بۆپەیدا بکات بەو پارەیە لایان بووو بیخۆن،وەکو دوایی بەدرێژە باسیان دێت ﴿لنعلم اى الحزبين احصى لما لبثوا امدا﴾ تا بزانین و دەرکەوێ کام یەك لەو دوو دەستەو گروپەیان -کە قسەیان جیاوازە لە بارەی دیارییکردنی ماوەی مانەوەیان- هەر بە هەژمار ساڵەکانی مانەوەیان لەبیرماوە، کام لە دوولا دەزانن کەچەندساڵە خەویان لێکەوتووە، ئەگەر چی ئێمە خۆشمان چاك دەیزانین، بەڵام دەمانەوێ زانایی وتوانایی خۆمانیان نیشان بدەین تا زیاتر سووربن لەسەر باوەڕەکەیان.

لێرەوە داستانەکەیان بەدرێژە باس دەکاو دەفەرموێ: ﴿[13] نحن نقص عليك نبأهم بالحق﴾ ئێمە بەراستیی سەرگوروشتەو هەواڵی ئەوانەت - بێ زیادو کەم- بۆ دەگێڕینەوە ﴿إنهم فتية آمنوا بربهم﴾ بێگومان ئەوانە کۆمەڵە جاحێڵ و لاوێك بوون کە بەراستیی بڕوایان بە پەروەردگاری خۆیان هێنابوو ﴿وزدناهم هدى﴾ و ئێمەیش زیاتر لە نووری ئیمان ڕێنموونیمان کردن و، لەسەر ڕێگە ڕاستەکە سەقامگیرمان کردن، دەرەنجام ئارامیانگرت و کۆچیان کردو، بۆپاراستنی دینەکەیان چوونە ناو ئەو شاخ و کێوە، کەوابوو ئەی لاوەکانی قورەیش! ئێوەیش وەکو ئەوانبن وچاو لە خەڵکە پیرە دڵڕەقانتان مەکەن، دەسا ڕاپەڕن و بەرەو ڕێی هەق و ڕاستیی وەرن.

**تێبینی:** ئیمامی (بوخاریی) و زۆرێك لەزاناکان ئەم ئایەتەی(وزدناهم هدى..)یە دەکەنە بەڵگەی ئەوەکە (ئیمان) زیاد دەکات ﴿[14] وربطنا على قلوبهم﴾ ودڵیشیانمان پێکەوەبەست و، لەسەر هەق توندو قایم و پتەومانکرد و، ئارامیمان پێبەخشین ﴿إذ قاموا﴾ ئەوکاتەی وا ڕاپەڕین و، لەبەر دەستی پاشا ستەمکارەکەدا وەستان ﴿فقالوا ربنا رب السموات والأرض﴾ ئەوجا گوتیان: پەروەردگاری ئێمە، هەر پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوییە، تۆ هیچ شتێکت بەدەست نییە ﴿لن ندعو من دونه إلها﴾ دڵنیایشبە هەرگیز بێ لەو ناپەرستین وهاناو هاوار بۆ هیچ پەرسراوێکی تر نابەین ﴿لقد قلنا إذا شططا﴾ خۆ ئەگەر کەسێکیتر بپەرستین و هاواری بۆبەرین دیارەکە بێگومان وشەیەکی ستەم و درۆو ناحەقیی بەدەممانداهاتووە،لە ڕاستییەکان تێپەڕمانکردووە و لاماندواە ﴿[15] هؤلاء قومنا اتخذوا من دونه آلهة﴾ ئەمانەکە لە هۆزو خەڵکانی ئێمەن، بێ لە خوا چەندین خواو پەرستراویان بۆ خۆیان گرتووو

هەڵبژارد، کە بەراستیی کارێکی زۆر خراپ وناهەقییان کردووە! ﴿لولا یأتون علیهم بسلطان بین﴾ دەسا بۆچی بەڵگەیەکی ئاشکرا لەسەر راستییان ناهێنن، ئەگەر راست دەکەن ئەوانە خوان ﴿فمن أظلم ممن افتری علی الله کذبا﴾ جادەبێ‌کێ لەوکەسە ستەمکارتربێت کە: لە سەر خوا درۆ هەڵبەسێ وبڵێ خوا شەریکی هەیە؟ دیارە –بێ لەو– هیچ کەسێك نییە، مەگەر هەر ئەوە کە هاوبەشی بۆ دانابێ.

**یارانی ئەشکەوت لە خەڵك هەڵبڕان و چوونە غارەکەوە:**

﴿[١٦] وإذ اعتزلتموهم وما یعبدون إلا الله﴾ ئەوجا هەندێ لە یارانی ئەشکەوت بەوانی تریانیان گوت: کەبڕیارە ئێوە کەناربگرن و دوورەپە رێزبن لەو خەڵکەو لە پەرستراوەکانیان کە لەجیاتی خوا دەیانپەرستن ﴿فأوا إلی الکهف﴾ دەسا بەم ئەشکەوتە پەنابەرن و بچنە نێوی,و, لەناو گەلی ئاوای بێ‌دیندا دامەنیشن ﴿ینشر لکم ربکم من رحمته﴾ پەروەردگاریشتان رەحمەت و میهرەبانی خۆیتان بۆ پەخش دەکاو دەرووی خێرتان لێ دەکاتەوە ﴿ویهیئ لکم من امرکم مرفقا﴾ و کاروباری کۆچەکەتان و, رێگای رزگار بوونتان بۆ ئاسان دەکا و دەحەوێنەوە، ئەوجا خەڵکەکەیان جێهێشت وبۆی دەرچوون وپێیان نەزانین، هەر وەکو پێغەمبەرﷺ لەگەڵ(ئەبووبەکر) دا کۆچیان کردو دوایشیان کەوتن و پێیشیان نەزانین.

**یاران لە شوێنێکی تەختی ئەشکەوتەکەدان:**

﴿[١٧] وتری الشمس إذا طلعت تزاور عن کهفهم ذات الیمین﴾ بەڵێ رۆشتنە ئەشکەوتەکەوە..جاکاتێ لە لای راستیانەوە خۆر هەڵدەهات، دەتبینی لە ئەشکەوتەکەیاندا تیشکی خۆرەکە کلا دەبوو لێیان ودەگەیشتە ناو غارەکەو ئەوانیش سوودیان لێ وەردەگرت ﴿وإذا غربت تقرضهم ذات الشمال﴾ کاتێکیش ئاوا دەبوولە لای چەپیانەوە,تێپەڕی دەکرد لێیان و تیشکەکەی نەدەچووە ئەشکەوتەکەیانەوە, واتە:گەرما ئازاری نەئەدان وشنەی بایان بۆ دەهات ﴿وهم فی فجوة منه﴾ ئەوانیش لە ناو بۆشایەکی تەخت و راستی ئەشکەوتەکەدا راکشابوون و، هەوایەکی ساف و پاکیان بۆ دەهات و، تیشکی خۆریان بەرنەدەکەوت، مەر ئەوەکە تیشکێکی نەرم و کزیان بەر دەکەوت تا جەستەیان تێك نەچێ.

بەڵێ.. لە دیارییکردنی جێی و شوێنەکەیاندا کێشە هەیە، هەندێ دەڵێن: نزیکی (بیت المقدس) بوون، بڕێکی تردەڵێن: نزیکی (نەینەوا)ی لای (موسڵ)بوون، هەندێکی تردەڵێن: لە وڵاتی(رۆم)بوون، خۆ ئەگەر دیارییکردنی جێگاکەیان پێویست بووبا و، شتێکی لە مەسەلەکە گۆڕیبا، ئەوا خوای کارزان بۆمانی دیاریی دەکرد، چونکە هیچ شتێکی پێویست نەماوەتەوە کە خوای گەورە وەکو پێویست روونی نەکاتەوە، پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: ((ماترکت شیئا یقربکم إلی الجنة ویباعدکم إلی النار، إلا وقد أعلمتکم به)) ئیبن کەسیر. ﴿ذلك من آیات الله﴾ ئەو کارە



وَإِذِ ٱعۡتَزَلۡتُمُوهُمۡ وَمَا يَعۡبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ فَأۡوُۥٓاْ إِلَى ٱلۡكَهۡفِ
يَنشُرۡ لَكُمۡ رَبُّكُم مِّن رَّحۡمَتِهِۦ وَيُهَيِّئۡ لَكُم مِّنۡ أَمۡرِكُم مِّرۡفَقٗا
(١٦) ۞ وَتَرَى ٱلشَّمۡسَ إِذَا طَلَعَت تَّزَٰوَرُ عَن كَهۡفِهِمۡ ذَاتَ
ٱلۡيَمِينِ وَإِذَا غَرَبَت تَّقۡرِضُهُمۡ ذَاتَ ٱلشِّمَالِ وَهُمۡ فِي فَجۡوَةٖ
مِّنۡهُۚ ذَٰلِكَ مِنۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِۗ مَن يَهۡدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلۡمُهۡتَدِۖ وَمَن
يُضۡلِلۡ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ وَلِيّٗا مُّرۡشِدٗا (١٧) وَتَحۡسَبُهُمۡ أَيۡقَاظٗا
وَهُمۡ رُقُودٞۚ وَنُقَلِّبُهُمۡ ذَاتَ ٱلۡيَمِينِ وَذَاتَ ٱلشِّمَالِۖ وَكَلۡبُهُم
بَٰسِطٞ ذِرَاعَيۡهِ بِٱلۡوَصِيدِۚ لَوِ ٱطَّلَعۡتَ عَلَيۡهِمۡ لَوَلَّيۡتَ مِنۡهُمۡ
فِرَارٗا وَلَمُلِئۡتَ مِنۡهُمۡ رُعۡبٗا (١٨) وَكَذَٰلِكَ بَعَثۡنَٰهُمۡ
لِيَتَسَآءَلُواْ بَيۡنَهُمۡۚ قَالَ قَآئِلٞ مِّنۡهُمۡ كَمۡ لَبِثۡتُمۡۖ قَالُواْ لَبِثۡنَا
يَوۡمًا أَوۡ بَعۡضَ يَوۡمٖۚ قَالُواْ رَبُّكُمۡ أَعۡلَمُ بِمَا لَبِثۡتُمۡ فَٱبۡعَثُوٓاْ
أَحَدَكُم بِوَرِقِكُمۡ هَٰذِهِۦٓ إِلَى ٱلۡمَدِينَةِ فَلۡيَنظُرۡ أَيُّهَآ أَزۡكَىٰ
طَعَامٗا فَلۡيَأۡتِكُم بِرِزۡقٖ مِّنۡهُ وَلۡيَتَلَطَّفۡ وَلَا يُشۡعِرَنَّ
بِكُمۡ أَحَدًا (١٩) إِنَّهُمۡ إِن يَظۡهَرُواْ عَلَيۡكُمۡ يَرۡجُمُوكُمۡ
أَوۡ يُعِيدُوكُمۡ فِي مِلَّتِهِمۡ وَلَن تُفۡلِحُوٓاْ إِذًا أَبَدٗا (٢٠)

یەکێکە لە نیشانەکانی دەسەڵاتی خوا! ﴿من یهد الله فهو المهتد﴾ هەرکەسێ خوا ڕێنمایی و شارەزای بکات، وەکو چۆن یارانی ئەشکەوتی خستە سەر ڕێی هیدایەت، ئەوە ڕێی دۆزیوەتەوەو ڕێنوێن بووە ﴿ومن یضلل فلن تجد له ولیا مرشدا﴾ هەر کەسێکیش بەهۆی کاری ناپەسەندی خۆیەوە خوا سەری لێ تێك بدات، هەرگیز تۆ ناتوانی هیچ دۆستێکی ڕابەری بۆپەیدا بکەیت، تا بیخاتەوە سەرشاریێ، وەکو ئەوپاشاو قەومە چەواشە کراوەیە.

**لە غارەکەدا خەوتوون:**

﴿[١٨] وتحسبهم ایقاظا وهم رقود﴾ ئەگەر سەیرتان کردبان، ئەو دەمە نووستبوون کەچۆن چاویان کرابوویەوەو، ئەم دیوو ئەو دیویان دەکرد، وات دەزانی بێدارن و بەخەبەرن" کەچی لەواقیعدا خەوتوون ﴿ونقلبهم ذات الیمن وذات الشمال﴾ وە ئێمە بە لای ڕاست و چەپدا هەڵگێڕو وەرگێڕو ئەم شانەو شانیان پێدەکەین، بۆ ئەوەی نەڕزێن و زەویی جەستەیان نەخواو، وەکو خۆیان بمێننەوە ﴿وکلبهم باسط ذراعیه بالوصید﴾ سەگەکەشیان کە دوایان کەوت بوو لەبەردەم ئەشکەوتەکەدا هەردوو زەندەو دەستی خۆی ڕاخستبوو، دەتگوت پاسەوانییان دەکات، بەڵێ.. هاوڕێیەتی چاکان و نەمران هەمیشە مایە نەمریی بووە، بۆیە هەتا دنیا دنیا بێت، ناوو شۆرەتی ئەو سەگەیە لە گەڵ نەمراندا هەر دەمێنێتەوە ﴿لو اطلعت علیهم لولیت منهم فرارا﴾ بەشێوەیەکی وا کە ئەگەر تۆ چوبای بت دیبان لەسەر ئەو حاڵەتەیان کە: چۆن خەوتوون و ئەم دیوو ئەو دیو و شانەو شان دەکەن، بەڕاکردن بەرەو دوا دەگەڕایتەوەو هەڵدەهاتیت ﴿ولملئت منهم رعبا﴾ دڵ و و دەروونیشت پڕ دەبوو لەترس، چونکە ئەوحاڵەتەیان، حاڵەتێکی دژوارو ترسناکە، هەتا کەسێك نەتوانێ لێیان نزیك ببێتەوەو دەسکاریی جەستەیان بکات.

**وە خەبەرمان هێنان و چوونە نێو شار بۆ بژێوی:**

﴿[١٩] وکذلك بعثناهم﴾ بەڵێ.. هەرچۆنێك خەواندمانن، هەرئاوایش پاش(٣٠٩)ساڵ لە خەوهەڵمانساندن و وەخەبەرمان هێنان ﴿لیتساءلوا بینهم﴾ تا لە نێوان خۆیاندا لە یەکتر بپرسن: ئاخۆ چەند لەو ئەشکەوتەکەدا مابنەوە؟ ﴿قال قائل منهم کم لبثتم﴾ بۆیە قسەکەرێکیان گوتی: باشە! دەبێ چەندمابنەوەو، نوستووبن لەم ئەشکەوتەدا؟ ﴿قالوا لبثنا یوما او بعض یوم﴾ زۆر بە ئاساییەکەوە گوتیان: ڕۆژێك، یان بەشێکی ماوینەتەوە، بۆیە بۆچوونیان وابوو،چوونکە کاتێ چوونە ئەشکەوتەکەوە، سەرلە بەیانی بوو، کاتێکیش وە خەبەرهاتن ئاخری ڕۆژ بوو ﴿قالوا ربکم اعلم بما لبثتم﴾ دیارە قسەو بۆچوونیان لێك جیاوازبوو، بۆیە بە ئەنجام نەگەیشتن و، گوتیان: لەڕاستییدا تەنها مەرهەر پەروەردگارتان بزانێ چەندە نوستوون و چەند ماونەتەوە، بۆیە باش وایە حەواڵە بەزانیاریی خوای زانا بکرێت ﴿فابعثوا احدکم بورقکم هذه إلی المدینة﴾ دەسا هەر ئێستا یەکێکتان بەم (دراوونوقرەو زیوەوە) بنێرنە نێو شار ﴿فلینظر أیها ازکی طعاما﴾ با تەماشا بکات کام خواردن و خۆراکی زۆر چاك و پاکە ﴿فلیأتکم برزق منه﴾ با بە ئەندازەی پێویست بۆتانی بهێنێ ﴿ولیتلطف﴾ وبا زۆر بە سەرنج و زیتیی ببزوێتەوە، زۆر بەنهێنێ بڕواتە ناوشارەوەو خواردەنەکە بکرێ ﴿ولا یشعرن بکم احدا﴾ و هیچ کەسێکیشتان لێ بەئاگا نەکات، واتە:بە شێوەیەك کەس پێمان نەزانێ ﴿[٢٠] إنهم إن یظهروا علیکم یرجموکم﴾ چونکە بەڕاستیی ئەگەر ئاگادارتان بن و پێتان بزانن، یائەوەتە بەردەبارانتان دەکەن ﴿او یعیدوکم فی ملتهم﴾ وە یان دەتانگێڕنەوە بۆ ناوئایینی بتپەرستیی خۆیان ﴿ولن تفلحوا إذا ابدا﴾ ئەوکاتە ئیتر لەدنیاو لە قیامەتدا هەرگیز بەختەوەرو ڕزگار نابن. بەڵێ.. ئا بەوشێوەیە بۆسەرخستنی کارەکەیان ئەو هەموو ئەسباب و هۆیانەیان بەکار هێناو،هۆشیارییان بە یەکتردا.

**خەڵك پێبزانین و (بۆ یادداشت) خانوویەكیان لەسەر كردن:**

﴿[٢١] وكذلك اعثرنا علیهم﴾ هەروەكو لە خەوهەڵمانساندن - دوای ئەو گشت ماوەیە - هەر ئاوایش خەڵكێكمان لێ بەئاگاكردن ﴿لیعلموا ان وعد الله حق﴾ تا ببینن و بزانن كە: بێگومان بەڵێنی خوا بۆ زیندوو بوونەوە راست و دروستە ﴿وأن الساعة آتیة لا ریب فیها﴾ وبە یەقینیش بەدەر لە دوودڵی قیامەت هەر پەیدا دەبێت ﴿إذ یتنازعون بینهم أمرهم﴾ جا ئەودەمەی كە خەڵكەكە بەدیداریان شادبوو، سەریان لە راوێژنا سەبارەت بەوە چی بكەن بەرامبەریان ﴿فقالوا ابنوا علیهم بنیانا﴾ ئەوانەیان لێیان بە ئاگا كرابوونەوە،بوونە دوو بەشەوە: هەندێكیان وتیان: چاك وایە ماڵۆچكە و گومەزییەكیان لەسەر دروس بكەن، بۆ ئەوەی ئەوشوێنەیە وەكوشتێكی مێژوویی هەربمێنێتەوە، پاشان دەرگای ئەشكەوتەكەیان لێدابخەنەوەو وازیان لێبهێنن ﴿ربهم أعلم بهم﴾ پەروەردگاریان لە ئێوەچاكتر دەیانناسێ ﴿قال الذین غلبوا علی امرهم﴾ بەڵام ئەوانەی كە زۆرینە بوون وقسەیان باشتر دەڕۆیی گوتیان: ﴿لنتخذن علیهم مسجدا﴾ نا.. بەخوا سوێند، دەبێ پەرستگەو مزگەوتێكیان لەسەر دروست بكەین ئەوەش لەوسەردەمەدا باوبووە، واتە: لەدەم دەرگای ئەشكەوتەكەدا، سەرەنجام قسەی ئەم دەستەی دووەمە سەریگرت.

بەڵێ مەسەلەی مزگەوتكردنە گۆڕستان و ناشتنی مردوان تێیداو، نوێژ تێدا كردنی: زانا شارەزاكانی دینی ئیسلام، كاری وایان بەكارێكی ناپەسەندو نارەوا داناوەو، بەتوندیی ڕێیان لێگرتووە، تەنانەتی شیخی (ئیبن حەجەر) لە كتێبی (زەواجر) دا بە گوناهی گەورەی داناوە.

پێشەوا (ئەحمەد، ئەبو داود، ترمزیی، ئیبن ماجە) لە (عەبدوڵڵای كوڕی عەباس)ـەوە دەگێڕنەوەكە: پەیامبەر ﷺ فەرموویەتی: ((لعن الله تعالی زائرات القبور والمتخذین علیها المساجد والسرج)).واتە: نەحلەتی خوا لەو ژنانە كە دەچنە سەر گۆڕ، ولەوانەش كە مزگەوت دروست دەكەن لەسەر گۆڕوچراو كارەبایان لەسەر هەڵدەكەن. پێشەوا (موسلیم)یش ئەمەی بۆ زیاد كردووە: ((ألا وإن من كان قبلكم یتخذون قبور أنبیائهم مساجد وإني أنهاكم عن ذلك)) واتە:بزانن! ئەگەر ئەوانەی بەر لەئێوە گۆڕی پێغەمبەرەكانیان كردبێتە مزگەوت، ئەوا من ڕێم لێگرتن. وەهەروا (موسلیم و نەسایی) لە خاتوو (عائیشە)وە ئەم فەرمودەیە دەگێڕنەوە: ((إن أولئك إذا كان فیهم الرجل الصالح فمات، بنوا علی قبره مسجدا وصوروا فیه تلك الصور، أولئك شرار الخلق یوم القیامة)) واتە:ئەوانەی بەر لەئێوە هەركە پیاوێكی صاڵحیان لێ دەمرد، مزگەوتێكیان لەسەر دەكردو وێنەو نەخش و نیگاری مردووەكەشیان ساز دەدا، دەسا چاك بزانن كە ئەوانە لە ڕۆژی قیامەتدا لە هەمووكسێك خراپترن.



وَكَذَٰلِكَ أَعۡثَرۡنَا عَلَيۡهِمۡ لِيَعۡلَمُوٓاْ أَنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞ وَأَنَّ
ٱلسَّاعَةَ لَا رَيۡبَ فِيهَآ إِذۡ يَتَنَٰزَعُونَ بَيۡنَهُمۡ أَمۡرَهُمۡۖ فَقَالُواْ
ٱبۡنُواْ عَلَيۡهِم بُنۡيَٰنٗاۖ رَّبُّهُمۡ أَعۡلَمُ بِهِمۡۚ قَالَ ٱلَّذِينَ غَلَبُواْ عَلَىٰٓ
أَمۡرِهِمۡ لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيۡهِم مَّسۡجِدٗا ٢١ سَيَقُولُونَ ثَلَٰثَةٞ
رَّابِعُهُمۡ كَلۡبُهُمۡ وَيَقُولُونَ خَمۡسَةٞ سَادِسُهُمۡ كَلۡبُهُمۡ رَجۡمَۢا
بِٱلۡغَيۡبِۖ وَيَقُولُونَ سَبۡعَةٞ وَثَامِنُهُمۡ كَلۡبُهُمۡۚ قُل رَّبِّيٓ أَعۡلَمُ
بِعِدَّتِهِم مَّا يَعۡلَمُهُمۡ إِلَّا قَلِيلٞۗ فَلَا تُمَارِ فِيهِمۡ إِلَّا مِرَآءٗ ظَٰهِرٗا
وَلَا تَسۡتَفۡتِ فِيهِم مِّنۡهُمۡ أَحَدٗا ٢٢ وَلَا تَقُولَنَّ لِشَاْيۡءٍ
إِنِّي فَاعِلٞ ذَٰلِكَ غَدًا ٢٣ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُۚ وَٱذۡكُر رَّبَّكَ
إِذَا نَسِيتَ وَقُلۡ عَسَىٰٓ أَن يَهۡدِيَنِ رَبِّي لِأَقۡرَبَ مِنۡ هَٰذَا رَشَدٗا
٢٤ وَلَبِثُواْ فِي كَهۡفِهِمۡ ثَلَٰثَ مِاْئَةٖ سِنِينَ وَٱزۡدَادُواْ تِسۡعٗا
٢٥ قُلِ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا لَبِثُواْۖ لَهُۥ غَيۡبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ
أَبۡصِرۡ بِهِۦ وَأَسۡمِعۡۚ مَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَلِيّٖ وَلَا يُشۡرِكُ
فِي حُكۡمِهِۦٓ أَحَدٗا ٢٦ وَٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِن كِتَابِ
رَبِّكَۖ لَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦ وَلَن تَجِدَ مِن دُونِهِۦ مُلۡتَحَدٗا ٢٧

ئیمامی (قورتوبیی) دەڵێ: (قال علماؤنا: وهذا یحرم علی المسلمین أن یتخذوا قبور الأنبیاء و العلماء مساجد)، واتە:زاناکانی دینی ئیسلام دەڵێن: ئەمە وا دەگەیەنێت کە لەسەر موسڵمانان حەرامە گۆڕی پێغەمبەرەکان و زاناکان بکەنە مزگەوت. فەرموودەیەکیش هەیە کە ئیمامی موسلیم دەیگێڕێتەوە: ((لا تصلوا إلی القبور، ولا تجلسوا علیها)). پاشان قورتوبیی دەڵێ: (أی لا تتخذوها قبلة، فتصلوا علیها أو إلیها کما فعل الیهود والنصاری).

### ژمارەیان چەندە؟

﴿[٢٢] سیقولون ثلاثة رابعهم کلبهم﴾ ئەو جوولەکانەی لەچەرخی پەیامبەردا ﷺ دەژیان لەبارەی ژمارەیانەوە دەڵێن: سێن و بە سەگەکەیانەوە چوارن ﴿ویقولون خمسة سادسهم کلبهم﴾ هەندێکی تریان دەڵێن: پێنج کەسن و بە سەگەکەیانە وە شەشن ﴿رجما بالغیب﴾ ئەم دوودەستەیە هەر لەخۆیانەوە بێ بەڵگە قسەدەکەن و، دوای خەیاڵات کەو توون و، دەست لەکاری نادیار دەدەن, واتە: لەو قسە و باسەیاندا یەقینیان نییەو، بەخەیاڵ دەیکەن ﴿ویقولون سبعة وثامنهم کلبهم﴾ دەستەیە تریان دەڵێن: حەوت کەسن و هەشتەمینیان سەگەکەیانە. جابۆ دوو را پێشووەکە فەرمووی: (رجما بالغیب) بەڵام بۆ رای سێیەم هیچی نەگوت و بێدەنگ بوو، وەکو تەسدیقی ئەم ڕاو بۆچوونەی دواییەی کردبێ وایە، واتە: بە سەگەکەوە دەبنە هەشت ﴿قل ربی أعلم بعدتهم﴾ ئەی پێغەمبەر! ﷺ پێیان بڵێ: لە راستییدا هەر پەروەردگارم بە ژمارەیان زاناترە، کەواتە خۆدان لەو قسەو باسە بێ قازانج وبێ کەڵکە ﴿ما یعلمهم إلا قلیل﴾ دەستەیەکی کەمیان نەبێ بۆی نەچوون و ژمارەیان نازانن.(ئیبن عەباس) دەڵێت: من یەکێکم لەوانە کەدەزانم چەند کەسن، ئەوانە حەوت بوون , ئەمە ئەگەرچی هیچ فەرموودەیەکیش بۆ دیارییکردنی ژمارەیان نەهاتووە، بەڵام (ئیبن عەباس) بە زیرەکی و تێگەیشتنی خۆی دەیزانی کە حەوت کەسن ﴿فلا تمار فیهم إلا مراء ظاهرا﴾ جا کەواتە تۆیش لەبارەی ژمارەیانەوە زۆر بە ئاسانی باس بکەو، ئەوەند لەسەری مەچۆ، واتە: چۆنمان بۆ باسم کردییت،هەر ئاواش قسەیان لەگەڵ بکە، قسەکردن لە ژمارەیان کەڵکێکی ئەوتۆ نابەخشێت ﴿ولا تستفت فیهم منهم أحدا﴾ وە لە بارەی ژمارەشیانەوە لە کەسێك لەو خاوەن نامانە مەپرسە, چونکە هەر وەحی بەسە بۆتۆ.

(ئیبن کەسیر) دەڵێت: جارێك دەنگ و باسی (أصحاب الکهف)یان لەپەیامبەر ﷺ پرسی، ئەویش فەرمووی: بەیانی وەڵامتان دەدەمەوە، کەچی وەحیی و سروش بۆ وەڵامەکەی، پازدە رۆژ دواکەوت، پاشان ئەو ئایەتە هات و فەرمووی: ﴿[٢٣] ولا تقولن لشیء إنی فاعل ذلك غدا* [٢٤] إلا أن یشاء الله﴾ هەرگیز لە بارەی هیچ شتێکەوە بەدڵنیاییەوە مەڵێ: من بەیانی ئەوکارە دەکەم، بە وشەی (إن شاء الله) وەنەبێت، واتە: کاتێ ئەتەوێ هەرشتێ بکەیت, هەردەبێ بڵێیت: إن شاءالله. ﴿واذکر ربك إذا نسیت﴾ وەهەر کە لەبیرت چوو (إن شاء الله) بکەیت و ئەوجا وەبیرت هاتەوە،هەر دەبێ(إن شاء الله) بکەیت، وەهەمیشەش یادی پەروەردگارت فەرامۆش نەکەیت ﴿وقل عسی أن یهدین ربی لأقرب من هذا رشدا﴾ وە لەوەڵامی هەر پرسیارێکدا بڵێ: هیوادارم پەروەردگارم لەمە باشتر ونزیکتر بە هەقەوە شارەزاو رێنماییم بکات.

### چەند مانەوە لە غارەکەدا؟

﴿[٢٥] ولبثوا فی کهفهم ثلاث مائة سنین﴾ لاوەکانیش لەئەشکەوتەکەیاندا سێ سەدساڵی هەتاویی بەخەوتوویی مانەوە ﴿وازدادوا تسعا﴾ و نۆ ساڵیشیان بۆ زیاد کرد، واتە: ئەگەر بەساڵی هەتاویی حسێب بکرێت (٣٠٠) ساڵی رەبەق مانەوە، خۆئەگەر بە ساڵی مانگی (هیلال) یش لێك بدرێتەوە (٣٠٩) ساڵ مانەوە. لە پێشەوە فەرمووی: (سنین عددا) جا گومان لەوەدا نییە کە ئەمە گەورەترین بەڵگەو نیشانەی راستیی پەیامبەرە ﷺ، لە کاتێکدا کەئەو

نە لە کۆلێژی بیرکاریی و ماتماتیك، وەنە لە دانشگای گەردوونناسییدا فێربووە، ئەی ئەگەر ئەوە موعجیزە نەبێت؟ باشە ئەو چۆن دەزانێ کە هەر سەد ساڵی هەتاویی، سێ ساڵی مانگیی زیاد دەکاوپێش دەکەوێ، وە هەر ساڵێکی هەتاویی (١١) رۆژ زیاد دەکاودەڕواتە پێشەوە؟ ﴿[26] **قل الله أعلم بما لبثوا**﴾ پێیان بڵێ: هەرخوا خۆی باشتر دەزانێ لەوئەشکەوتەدا چەندمانەوە، واتە: زانینی حەواڵەی زانست و زانیاریی خوای گەورەی بکە ﴿**له غیب السموات والأرض**﴾ هەرچی نادیارو داپۆشراوی ئاسمانەکان و زەوی هەیە – بەدەنگو باسی یارانی ئەشکەوتیشەوە– بۆخوایە, وە ئەوە لای ئەو دیارو ئاشکرایەو چاك دەیزانێ ﴿**أبصر به**﴾ ئای خوا چ بینایە بۆهەمووشتێ ﴿**وأسمع**﴾ وچ ژنەوایشە، واتە: بینین و بیستنی خوا بێ سنوورە، وەکو بینین و بیستنی هیچ کەسێ نییە ﴿**ما لهم من دونه من ولی**﴾ بۆیارانی ئەشکەوت –جگە لەو زاتی الله یە– هیچ پشت و پەناو دۆسێکیان دەس ناکەوێ هەتا بییان پارێزێ ﴿**ولا یشرك فی حکمه أحدا**﴾ وخوایش لە کارو بڕیاری خویدا هیچ کەسی نەکردووە بە هاوتاو هاوبەشی خۆی، بێ شەریك و بێ وەزیرو بێ هاوتایە، رازیش نابێت قسەی ناحەزو نەیارانی بخرێتە پاڵ قسەیەوە.

**قورئان بخوێنەو لەگەڵ ئیمانداران بە :**

﴿[27] **واتل ما أوحی إلیك من کتاب ربك**﴾ ئەی پێغەمبەر!هەرچی لە قورئان و کتێبەکەی پەروەردگارتدا بەوەحی بۆت هاتووە، بیخوێنەوەو کاری پێبکەو، تەنها تۆزقاڵەیە لێی لانەدەیت ﴿**لا مبدل لکلماته**﴾ نابێ کەسێك بڕیارو وشەکانی خوابگۆڕێ ﴿**ولن تجد من دونه ملتحدا**﴾ لە غەیرەز ئەو هیچ دۆست و پەناگایەکت دەست ناکەوێت،کەوابوو نابێ پەنا بەهیچ کەسێکیش بەریت ﴿[28] **واصبر نفسك مع الذین یدعون ربهم بالغداة والعشی یریدون وجهه**﴾ دان بە خۆتا بگرە لە گەڵ ئەوانەی کە بەیانیان و ئێواران لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوە ودەیپەرستن و، تەنیا رەزامەندیی ئەویشیان دەوێ، ئیتر داران، یان نەدار، بەهێزن، یان بێهێز، نابێ گوێ لە سەرانی قوریش بگریت کە: دەڵێن دەبێ (بیلال وعەممارو صوهەیب و خەبباب و..) لەدانیشتنەکاندا وەدەرنێیت ﴿**ولا تعد عیناك عنهم**﴾ هەرگیز چاویشت لێیان کل نەکەیت و پشتگوێیان نەخەیت، پەیامبەر ﷺ گەلێ سوور بوو لەسەر بڕوا هێنانی ناو دارەکانی قورەیش، بەشێوەیەك خەریك بوو لە هەژارەکان واز بێنێ و، خۆی بێ نیاز بکات لێیان، ئەوسا ئیتر قورئان هات و فەرمووی: هەر لەگەڵ ئەمانەدا بەو، گوێ بەوانە مەدە لەسەر رێی ئیسلام نین ﴿**ترید زینة الحیاة الدینا**﴾ بەمەبستی ئەوە روو لە جوانیی و زەرق و بەرقی ئەم دونیایە بکەیت ﴿**ولا تطع من اغفلنا قلبه عن ذکرنا**﴾ و بەگوێی ئەوە مەکە =کە لەبەر لاساریی خۆی = دڵمان بێ ئاگا کرد لە یادی خۆمان، بۆیە هەمیشە سەری کردۆتە دنیا ﴿**واتبع هواه**﴾ و شوێنی هەواو ئارەزووی خۆی کەوتووە و وازی لە فەرمانی خوای گەورە هێناوە ﴿**وکان أمره فرطا**﴾ و هەموو کارو

الجزء الخامس عشر — سورة الكهف

وَٱصۡبِرۡ نَفۡسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ
يُرِيدُونَ وَجۡهَهُۥۖ وَلَا تَعۡدُ عَيۡنَاكَ عَنۡهُمۡ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلۡحَيَوٰةِ
ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَا تُطِعۡ مَنۡ أَغۡفَلۡنَا قَلۡبَهُۥ عَن ذِكۡرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ
أَمۡرُهُۥ فُرُطٗا ٢٨ وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن
شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡۚ إِنَّآ أَعۡتَدۡنَا لِلظَّٰلِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمۡ سُرَادِقُهَاۚ
وَإِن يَسۡتَغِيثُواْ يُغَاثُواْ بِمَآءٖ كَٱلۡمُهۡلِ يَشۡوِي ٱلۡوُجُوهَۚ بِئۡسَ
ٱلشَّرَابُ وَسَآءَتۡ مُرۡتَفَقًا ٢٩ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ
ٱلصَّٰلِحَٰتِ إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجۡرَ مَنۡ أَحۡسَنَ عَمَلًا ٣٠ أُوْلَٰٓئِكَ
لَهُمۡ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهِمُ ٱلۡأَنۡهَٰرُ يُحَلَّوۡنَ فِيهَا مِنۡ أَسَاوِرَ
مِن ذَهَبٖ وَيَلۡبَسُونَ ثِيَابًا خُضۡرٗا مِّن سُندُسٖ وَإِسۡتَبۡرَقٖ مُّتَّكِـِٔينَ
الحزب ٣٠ فِيهَا عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِۚ نِعۡمَ ٱلثَّوَابُ وَحَسُنَتۡ مُرۡتَفَقٗا ٣١ ۞ وَٱضۡرِبۡ
لَهُم مَّثَلٗا رَّجُلَيۡنِ جَعَلۡنَا لِأَحَدِهِمَا جَنَّتَيۡنِ مِنۡ أَعۡنَٰبٖ وَحَفَفۡنَٰهُمَا
بِنَخۡلٖ وَجَعَلۡنَا بَيۡنَهُمَا زَرۡعٗا ٣٢ كِلۡتَا ٱلۡجَنَّتَيۡنِ ءَاتَتۡ أُكُلَهَا وَلَمۡ
تَظۡلِم مِّنۡهُ شَيۡـٔٗاۚ وَفَجَّرۡنَا خِلَٰلَهُمَا نَهَرٗا ٣٣ وَكَانَ لَهُۥ ثَمَرٞ فَقَالَ
لِصَٰحِبِهِۦ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَنَا۠ أَكۡثَرُ مِنكَ مَالٗا وَأَعَزُّ نَفَرٗا ٣٤

٢٩٧

فەرمانێکی لەرادەو لەسنوور دەرچووە، لە جێگایەکی تردا هەر لەوبارەیەوە دەفەرموێ: (ولا تمدن عينيك إلى ما متعنا به أزواجا منهم زهرة الحياة الدنيا لنفتنهم فيه ورزق ربك خير وأبقى).

**هەق و راستیی هەرلای خوایە، کێ بڕوا دەکاو کێش نایکا:**

﴿ [٢٩] وقل الحق من ربكم﴾ پێیان بڵێ: ئەی پێغەمبەر! ﷺ هەق و راستیی تەنها هەر ئەوەیە کە لە لای پەروەرگارتانەوە هاتووە بۆتان" کەواتە دوای ئەو بێ دینە غافڵانە مەکەون ﴿فمن شاء فليؤمن ومن شاء فليكفر﴾ ئینجا پاش دەرکەوتنی هەق و راستیی، هەمووشتان سەربەستن، کێ باوەڕدێنێ و موسڵمان دەبێ، با بڕوا بێنێ، کێش دەیەوێ کافرو بێ بڕوا بێت، باهەرکافربێت، دیارە ئەمە هەڕەشەیە، چونکە هەرگیز خوای گەورەڕازی نییە بەکوفروداوا لەخەڵك ناکات کە:بچن ڕێبازی کوفر هەڵبژێرن، لەولایشەوە هەق و ناهەق بەبوون و نەبوونی ماڵو سامانی ئەم دونیا نییە، هەتا وابزانن هەموو دوڵەمەندێك راست و چاك وپاکە، هەموو هەژارێکیش نەگریس و نەگبەتە. ﴿إنا أعتدنا للظالمين نارا﴾ بێگومان ئێمە ئاگرێکی گەرممان بۆ ناهەقکاران و ستەمکارانی کافران ئامادە کردووە ﴿احاط بهم سرادقها﴾ کە گڕو بڵێسەکەی، یان درێژییەکەی وەك پەردەی خێوەت هەموولایەکی گرتوون، پێغەمبەر ﷺ لە تۆکمەیی و مەحکەمی دیوارەکانی ئاگری دۆزەخدا دەفەرموێ: چوار دیواری وای بە دەورا کراوە کە ئەستوریی هەریەکەیان ماوەی چل ساڵە ڕێیە. پێشەوا ئەحمەد ﴿وإن يستغيثوا﴾ خۆ ئەگەر زۆریان بۆهات و هاواریان لێ بەرز بوویەوەوداوای ئاویان کرد ﴿يغاثوا بماء كالمهل يشوى الوجوه﴾ ئاوێکیان فریا دەخرێ وەك قوڕقوشمی تواوەیەو، دەم و چاویان لەبەر زۆر گەرمیی خۆی هەڵدەکروزێنێ و دەیبرژێنێ ﴿بئس الشراب وساءت مرتفقا﴾ ئای چ خواردنەوەیەکی ناله بارو خراپە ئەو ئاوە، ئای چ ژینگەو جێیەکی ناله بارو خراپە ئەودۆزەخە!! لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: (وسقوا ماء حميما فقطع أمعاءهم).

**پاداشی کارچاکان ون نابێ:**

﴿ [٣٠] إن الذين آمنوا وعملوا الصالحات﴾ بێگومان ئەوانەش کە بڕوایان هێناوەوکارو کردەوەی چاك ئەنجام دەدەن ﴿إنالا نضيع اجر من احسن عملا﴾ بادڵنیابن کەئێمە پاداشتی ئەو جۆرە کەسانە زایە ناکەین کە: کارو ڕەفتاری چاك ئەنجام دەدەن ﴿ [٣١] أولئك لهم جنات عدن تجري من تحتها الأنهار﴾ کەسانی وا بۆ نشیمەن و حەوانەوەیان دەیانبەینە ناو باغاتێك،کە چۆم و ڕووبارێکی زۆر بەبەردارو درەختەکەیدا دەڕوا ﴿يحلون فيها من أساور من ذهب﴾ دەس بەندو بازنیی زێڕینیشیان لەدەست دەکرێ، واتە: لە سێ جۆر بازن دەکرێتە دەستیان: (زێڕ، زیو، لۆلۆ) دیارە ئەوجۆرانە هەندێ لەپاشایان لە دنیادا لە دەستیان دەکردن، بەڵام لە قیامەتدا تایبەتە بەو هەژارو بێ نەوایانەوە لەدنیادا نەبووبوون ﴿ويلبسون ثيابا خضرا﴾ جل و بەرگی بەنرخ و سەوزیش لەبەر دەکەن (چوون ئەو ڕەنگە بۆ چاو زۆر لەبارو مایەی خۆشحاڵی وشادییە) ﴿من سندس واستبرق﴾ دوو تۆییە، چینی ژێرەوە ئاوریشمێکی زۆر ناسك ونەرمەو پێی دەڵێن (سوندس)، چینی سەرەوەیشی ئاوریشمێکی ئەستوورە و پێی دەڵێن: (ئیستەبرەق) ﴿متكئين فيها على الآرائك﴾ بەئەو پەڕی خۆشیی و شادییەوە لەسەر کورسی و قەنەفەی جوان و ڕازاوە شانیان داداوە ﴿نعم الثواب﴾ چ پاداشتێکە ﴿وحسنت مرتفقا﴾ وچاك جێگایەکی حەوانەوەیە، لە سوورەتی (فورقان)یشدا دەفەرموێ: (أولئك يجزون الغرفة بما صبروا ويلقون فيها تحية وسلاما.خالدين فيها حسنت مستقرا ومقاما).

**نەزیلەی موشریکی داراو، موسڵمانی نەدارا:**

﴿[٣٢] واضرب لهم مثلا رجلين﴾ تۆ نمونەو نەزیلەی دووپیاو بۆ موشریکەکان بهێنەوە ئەی پێغەمبەر! کەدونیا لایان زۆر بەنرخەو بە پێغەمبەر دەڵێن: دەبێ موسڵمانە هەژارەکان دوورەوە خەیت ﴿جعلنا لأحدهما جنتين من أعناب﴾ دوو باخە(رەزمان) بە یەکێکیاندا بوو ﴿وحففناهما بنخل وجعلنا بينهما زرعا﴾ و بە(دارخورما) دەورماندابوون و، لەنێوانیشیاندا مەزراو بێستانێکمان شین کردبوو، دیارە کە دیمەنی ئاوا، دیمەنێکی زۆرجوان و دڵڕفێنە: رووبارو ئاوی رەوان هەڵقوڵێن، باخە رەزی تریێ و، باخە خورما دەورەی بدا، ئەوجا رەزو دانەوێڵە لەپاڵ یەکدا لەگەڵشەدا بێ و هەردەم شنەیان بێت ﴿[٣٣] كلتا الجنتين آتت اكلها﴾ ئەو دوو باخە هەردوو بەتێرو تەسەلی میوەی چاکیان ئەدا ﴿ولم تظلم منه شيئا﴾ و هیچیان لێ خەسار نەدەبوو ﴿وفجرنا خلالهما نهرا﴾ وە لەنێوان هەردوویاندا کانیی و رووبارێکی زۆرمان هەڵقوڵاند بۆ ئاودانیان و جوانیی و زینەتیان ﴿[٣٤] وكان له ثمر﴾ هەمیشە لە کاتی خۆیدا بەرو بووی دەدا ﴿فقال لصاحبه وهو يحاوره﴾ ئەوجا خۆی لێگۆڕاو بە فشەیەکەوە بەهاوەڵە هەژارەکەی گوت:﴿انا اكثر منك مالا واعز نفرا﴾ من ماڵ و سامانم لەتۆ زیاترە، وە بە دەستو پێوەندیش لەتۆ دەسەڵات ترم!! ﴿[٣٥] ودخل جنته وهو ظالم لنفسه﴾ رۆژێك بەکەش و فشێکەوە دەستیی هاوڕێ موسڵمانەکەی گرتوو و رۆیشتە ناو باخەکەیەوەو، خۆی بەشتێکی سەیرهاتە پێش چاو ﴿قال ما أظن أن تبيد هذه أبدا﴾ بە لووتێکی بەرزەوە گوتی: هەرگیز باوەڕ ناکەم ئەم باخ و باخاتەم تیا بچێت ﴿[٣٦] وما أظن الساعة قائمة﴾ باوەڕ ناکەم قیامەتیش هەرگیز بەرپا ببێت ﴿ولئن رددت إلى ربى لأجدن خيرا منها منقلبا﴾ خۆئەگەر هەر برایشمەوە بۆلای پەروەردگارم و قیامەتیش راست بوو هات، ودوای مردنیش زیندوو کرامەوە -وەکو تۆ دەڵێیت -دڵنیام کە لەوێش جێگایەکی چاکترو باخ و باخاتێکی رازاوەترم دەست دەکەوێ، چونکە شان و شەوکەتی خۆم ئەوە هەڵدەگرێت.

الجزء الخامس عشر — سورة الكهف

وَدَخَلَ جَنَّتَهُۥ وَهُوَ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ قَالَ مَآ أَظُنُّ أَن تَبِيدَ هَٰذِهِۦٓ
أَبَدًا ﴿٣٥﴾ وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةً وَلَئِن رُّدِدتُّ إِلَىٰ رَبِّى
لَأَجِدَنَّ خَيْرًا مِّنْهَا مُنقَلَبًا ﴿٣٦﴾ قَالَ لَهُۥ صَاحِبُهُۥ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ
أَكَفَرْتَ بِٱلَّذِى خَلَقَكَ مِن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ سَوَّىٰكَ رَجُلًا
﴿٣٧﴾ لَّٰكِنَّا۠ هُوَ ٱللَّهُ رَبِّى وَلَآ أُشْرِكُ بِرَبِّىٓ أَحَدًا ﴿٣٨﴾ وَلَوْلَآ إِذْ
دَخَلْتَ جَنَّتَكَ قُلْتَ مَا شَآءَ ٱللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِ إِن تَرَنِ أَنَا۠
أَقَلَّ مِنكَ مَالًا وَوَلَدًا ﴿٣٩﴾ فَعَسَىٰ رَبِّىٓ أَن يُؤْتِيَنِ خَيْرًا مِّن
جَنَّتِكَ وَيُرْسِلَ عَلَيْهَا حُسْبَانًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فَتُصْبِحَ صَعِيدًا
زَلَقًا ﴿٤٠﴾ أَوْ يُصْبِحَ مَآؤُهَا غَوْرًا فَلَن تَسْتَطِيعَ لَهُۥ طَلَبًا ﴿٤١﴾
وَأُحِيطَ بِثَمَرِهِۦ فَأَصْبَحَ يُقَلِّبُ كَفَّيْهِ عَلَىٰ مَآ أَنفَقَ فِيهَا وَهِىَ خَاوِيَةٌ
عَلَىٰ عُرُوشِهَا وَيَقُولُ يَٰلَيْتَنِى لَمْ أُشْرِكْ بِرَبِّىٓ أَحَدًا ﴿٤٢﴾ وَلَمْ تَكُن لَّهُۥ
فِئَةٌ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَمَا كَانَ مُنتَصِرًا ﴿٤٣﴾ هُنَالِكَ ٱلْوَلَٰيَةُ
لِلَّهِ ٱلْحَقِّ هُوَ خَيْرٌ ثَوَابًا وَخَيْرٌ عُقْبًا ﴿٤٤﴾ وَٱضْرِبْ لَهُم مَّثَلَ ٱلْحَيَوٰةِ
ٱلدُّنْيَا كَمَآءٍ أَنزَلْنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخْتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلْأَرْضِ
فَأَصْبَحَ هَشِيمًا تَذْرُوهُ ٱلرِّيَٰحُ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ مُّقْتَدِرًا ﴿٤٥﴾

٢٩٨ — ٱلْمَالُ وَٱلْبَنُونَ

**ئیمانداره نەدارەکە بە ئاخافتن هات:**

﴿[٣٧] قال له صاحبه وهو يحاوره﴾ هاوەڵە ئیماندارەکەیشیپێیگوت: ﴿اكفرت بالذى خلقك من تراب﴾ ئەرێ کافرو بێ باوەڕ بووی بەو خوایە کە لەبنەچەی تۆی لەگڵ دروستکرد؟ ﴿ثم من نطفة﴾ پاشان لەتنۆکە ئاوێکی قێزەون ﴿ثم سواك رجلا﴾ ئەوجاقۆناغ بەقۆناغ کردیتی بەپیاوێکی تەواوو، ئێستایش یاخیی بوویت؟! ﴿[٣٨] لكنا هو الله ربى﴾ بەڵام -چاك بزانە- کەمن پێ لێ دەنێم و دەڵێم: کە هەرئەو (الله)یە پەروەردگارو بەدیهێنەرم ﴿ولا اشرك بربى احدا﴾ و هیچ کەسیش ناکەمە هاوتاو هاوبەشی پەروەردگارم ﴿[٣٩] ولولا إذ دخلت جنتك﴾ دەبووئەو کاتە

چوویتە ناو باخەکەتەوەو ئەو گشت بەروبوومەت دییت ﴿قلت ما شاء الله لا قوة إلا بالله﴾ گوتبات: (ماشاء الله) لەم هەموو بەهرەو نیعمەتەیە خوابەمەیلی خۆی پێیداوم، دیارەهەرچی بدات دەیدات , باوەڕیشم وایە هیچ هێزێك بۆمن نیە لە فەراهەمهێنانی, بە هێزو پشتیوانی خوا نەبێ ,ئەوە دەستەبەر بوو بۆ بەردەوامی ئەو نیعمەتەت.

(سەلەف) دەڵێت: هەر کەسێك شتێکی دیت و سەری سوڕمالێی بڵێت: (ماشاءالله لاقوة إلا بالله) پێغەمبەریش=ص= فەرمووی: ((الا ادلك على كنز من كنوز الجنة؟: لاحول ولا قوة إلا بالله)) فتح الباری:٢١٧/١١. ﴿إن ترن انا اقل منك مالا وولدا﴾ بەتایبەتی ئێستا کە تۆ من بەکەمتر بەماڵ و زاروڵە دەبینیی و، فیزم بەسەردا دەکەیت،دەبوو واتکردبا ﴿[٤٠] فعسى ربي أن يؤتيني خيرا من جنتك﴾ دوور نییە پەروەردگارم لەباخەکەی تۆ چاکترم پێ ببەخشێت" من دەوڵەمەند بکا و تۆ هەژار ﴿ويرسل عليها حسبانا من السماء﴾ وە سزاو بەڵایەکیش لەئاسمانەوەبۆ باخەکەت بنێرێت ﴿فتصبح صعيدا زلقا﴾ و ببێتە زەوییەکی رووت و خلیسك و بێروون و قاقڕ ﴿[٤١] أو يصبح ماؤها غورا﴾ یائاوەکەی بە ناخی زەوییدا رۆبچێ و تەواوی بەرو بووم و دارو درەختەکەیشی تیا بچێت، وەکو لە کۆتایی سوورەتی(ملك) دا هەر لەو بارەیەوە دەفەرموێ: (قل أرأيتم إن أصبح ماؤكم غورا فمن يأتيكم بماء معين). ﴿فلن تستطيع له طلبا﴾ ئیتر هەرگیز نەتوانی بەدەستی بێنی و، جارێکی تر سوودی لێوەرگری.

**ئەنجامی شیرك هەر بەد بەختیە :**

﴿[٤٢] وأحيط بثمره﴾ سەرەنجام قسەی هاوەڵی خواناسی هاتەدیی و لە هەموو لایەکەوە بەڵاو ئافەت رووی تێکردو فەوتاندی ﴿فأصبح يقلب كفيه على ما أنفق فيها﴾ جا کە هاتە ناویی و ئەوەی دیت هاتبوو بەسەر باخەکەیدا، هەردوو دەستی دەدا بەیەکدا، لەداخی ئەو سامانەی تێیدا بەخت کردبوو بۆ ئاوەدان کردنەوەی ﴿وهي خاوية على عروشها﴾ وا ئێستایش باخ ودارکەپری باخەکەی گشت بەسەر یەکا کەوتوون و وێرانە ﴿ويقول يا ليتني لم أشرك بربي أحدا﴾ هەر دەڵێ: خۆزگە هیچ کەسێکم نەدەکردە هاوبەش بۆ پەروەردگارم و باوەڕی دامەزراوم هەر بەو دەبوو تا ئاوام لێ نەقەومایە ﴿[٤٣] ولم تكن له فئة ينصرونه من دون الله﴾ خۆلەخوایش بەولاوە هیچ دەستەیەکی وانەبوو(نەهۆزو عەشیرەتیی، نەکوڕو منداڵی) کۆمەکی پێ بکاو بەدەمیەوەبێ ﴿وماكان منتصرا﴾ بەبێ یاریدەدەر مایەوەو، خۆیشی هیچی پێ نەکرا, کەچی لەبەرا بەدارایی و خزم و عەشرەتیەوە خۆی هەڵدەکیشاو شانازی دەکرد، وا ئێستاش کەسێك نییە یارمەتییەکی بدات ﴿[٤٤] هنا لك الولاية لله الحق﴾ ئالەوێدا یارمەتی وکۆمەك هەربۆ خوای حەق و راستە بەتەنیا ﴿هوخير ثوابا وخير عقبا﴾ وە ئەو خۆی بۆ بەندەی ئیماندارو بە باوەڕیی, باشترین کەسێکە پاداشتی بداتەوە، وەباشترین کەسیشە پاشە رۆژی بۆ چاك بکات.

**نەزیلەی ژینی ئەم دنیایە :**

﴿[٤٥] واضرب لهم مثل الحياة الدنيا﴾ ئەی پێغەمبەر! ﷺ تۆ نەزیلەی ژیانی ئەم دونیایەیان بۆ بهێنەوە لە جوانی ورازاوەییدا,وەلە فەناو تیاچوونیدا ﴿كماء أنزلناه من السماء﴾ بەوەی کە وەکو ئەو ئاوە وایە کە لەئاسمانەوە دەیبارێنینە سەر زەویی ﴿فاختلط به نبات الأرض﴾ ئەوجا تێکەڵ بەرووەك و تۆوی ناو زەویی دەبێ و، هەموو تەرزە گژو گیایەکی جوان و هەمە جۆرەی پێ سەوز دەبێ , هەندێکی پێ ئاوێتە بە هەندێکی تری دەبێ و سەر لێك دەدەن و زەوی دەرازێننەوە ﴿فأصبح هشيما تذروه الرياح﴾ کەچیلەدوای ماوەیەك دەبێتەپووش و پەڵاش و(با) پرژو بڵاوی دەکاتەوە ﴿وكان الله على كل شئ مقتدرا﴾ وەهەمیشەخوای گەورە بەسەر هەموو شتێکا بەتواناو بەدەسەڵاتە، وە لەگەڵ جێگای تردا بە چەند شێوازێ تر ئەو مەسەل و نموونەیە دێنێتەوە، بۆ نموونە: لەم ئایەتەدا

دەفەرموێ: (إعلموا انما الحياة الدنيالعب ولهو وزينة وتفاخر بينكم وتكاثر فی‌الأموال والأولاد كمثل غيث أعجب الكفار نباته..) وەلەفەرموودەیەکیشدا هاتووە: ((..الدنيا حلوة خضرة..)) ﴿[46] **المال والبنون زينة الحياة الدنيا**﴾ ماڵ ومناڵ زینەت و جوانیی ژیانی دنیان, کەوابوو هەق نیە کەسێکی پێبخڵەتێ, لە ئایەتێکی تردابۆ تەئکیدی ئەوە دەفەرموێ: (زين للناس حب الشهوات من النساء والبنين والقناطير المقنطرة من الذهب والفضة..) ﴿**والباقيات الصالحات خير عند ربك ثوابا وخير أملا**﴾ وەکارو کردەوەچاکە هەرماوەکان, وەکوخزمەت بەدین وبە خەڵك وئاوەدانکردنەوەی شارو گوندو هەرکارێکی تر لەو شێوە, باشترەو باشترین هیوایە بۆ مرۆڤ.

(ئیبن کەسیر) دەڵێت: زۆربەی ریوایەتەکان دەڵێن: (الباقيات الصالحات) زیکری (سبحان الله، والحمدلله، ولا إله إلا الله، والله أكبر، ولا حول ولا قوة إلا بالله)یە.

الجزء الخامس عشر | سورة الكهف

المال والبنون زينة الحيوة الدنيا والبقيت الصلحت
خير عند ربك ثوابا وخير أملا (٤٦) ويوم نسير الجبال وترى
الأرض بارزة وحشرنهم فلم نغادر منهم أحدا (٤٧) وعرضوا
على ربك صفا لقد جئتمونا كما خلقنكم أول مرة بل زعمتم
ألن نجعل لكم موعدا (٤٨) ووضع الكتب فترى المجرمين
مشفقين مما فيه ويقولون يويلتنا مال هذا الكتب
لا يغادر صغيرة ولا كبيرة إلا أحصىها ووجدوا ما عملوا
حاضرا ولا يظلم ربك أحدا (٤٩) وإذ قلنا للملئكة اسجدوا
لآدم فسجدوا إلا إبليس كان من الجن ففسق عن أمر ربه
أفتتخذونه وذريته أولياء من دوني وهم لكم عدو
بئس للظلمين بدلا (٥٠) ما أشهدتهم خلق السموت
والأرض ولا خلق أنفسهم وما كنت متخذ المضلين عضدا
(٥١) ويوم يقول نادوا شركاءي الذين زعمتم فدعوهم
فلم يستجيبوا لهم وجعلنا بينهم موبقا (٥٢) ورءا المجرمون
النار فظنوا أنهم مواقعوها ولم يجدوا عنها مصرفا (٥٣)

نصف الحزب ٣٠

٢٩٩

**قۆناغە سەختەکانی هاتنی قیامەت:**

﴿[47] **ويوم نسير الجبال**﴾ وئاگاری خەڵك بکەوە بە رۆژێ کە کێوەکان (بەر لەهاتنی قیامەت) دەخەینە گەڕ وەکو هەور بەهەوادا دەڕۆن, وەك لەجێگایەکی تردا جەخت لە سەر ئەوە دەکاتەوەو دەفەرمووێ: (..وهی‌تمرمر السحاب..) یان دەفەرموێ: (وتكون الجبال كالعهن المنفوش). ﴿**وترى الأرض بارزة**﴾ و زەوییش بە رووتەڵ دەبینی کە: هیچ شتێکی بەسەرەوە نەماوە, نەکێو, نەدار, نەدرەخت، هەمووی تەخت بووە ﴿**وحشرناهم**﴾ ئەو خەڵکەیش هەموو (چاك و خراپیان) کۆ دەکەینەوە بۆ پرسیارو وەڵام و لێپرسینەوە لەکارو کردەوەکانی دنیایان ﴿**فلم نغادر منهم احدا**﴾ وە هیچ کەسێکیان ناهێڵینەوە بێ لێ پرسینەوە ﴿[48] **وعرضوا على ربك صفا**﴾ گشت ڕیز دەکرێن و ئەخرێنە بەردەستیی پەروەدگارت بۆ پرسینەوە ﴿**لقد جئتمونا كما خلقناكم أول مرة**﴾ خوا بە کافرو بێ باوەڕەکان دەفەرموێ: بەراستیی وائێستا هەموو بەڕووت و قووتیی و دەستی خاڵی هاتوونە لامان، هەر وەکو چۆن لەسەرەتاوە دروستمانکردن ﴿**بل زعمتم ان لن نجعل لكم موعدا**﴾ بەڵکوپێشتان وابوو کە هەرگیز وادەیەکتان بۆ دانانێین بۆ لێپرسینەوەو پاداشت و تۆڵە! ﴿[49] **ووضع الكتاب فترى المجرين مشفقين مما فيه**﴾ وەنامەی کارو کردەوەی هەموو کەس دەهێنرێ و دادەنرێ, ئەوسا دەبینی گشت ئیماندارەکان دڵخۆشن بەنامەکەیان، تاوانبارەکانیش هەموو دڵە لەرزێ و دڵە فڕێیانەو لەکارنامەکەیان دەترسن ﴿**ويقولون يا ويلتنا**﴾ و دەڵێن:ئەی تیاچوونی خۆمان! ﴿**ما لهذا الكتاب لا يغادر صغيرة ولا كبيرة إلا احصاها**﴾ ئەمە چ نامەیەکە؟ هەموو شتێك گەورەو بچوك، وردو درشتی لەخۆیدا جێکردۆتەوەو ئەژماردوویەتێ؟! ﴿**ووجدوا ما عملوا حاضرا**﴾ ئەوسا پاداشتی کارو کردەوەکانی خۆیان بە حازری دەبینن ووەری دەگرن ﴿**ولا يظلم ربك أحدا**﴾ پەروەردگاریشت ناهەقیی و ستەم لە هیچ کەسێك ناکات، بەناهەق سزای کەس نادات، پاداشتی چاککارانیش کەم ناکاتەوە، وەکو لە

سوورەتێکی تردا ئەم راستیە دووپات کراوەتەوەو دەفەرموێ: (إن الله لایظلم مثقال ذرة وإن تك حسنة یضاعفها..).
پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ((إن الجمّاء لتُقتصّ من القرناء یوم القیامة..)).

**سەرگورشتەی ئادەم و ئیبلیس:**

﴿٥٠ وإذ قلنا للملائكة اسجدوا لآدم﴾ ئەو رۆژگارە وەبیر بێنە کە بەفریشتەکانمان گوت: سوژدە بۆ ئادەم بەرن، دیارە کەمەبەست لەو سوژدەیە، سوژدەوکرنوشی رێزە، نەك سوژدەی پەرستن ﴿فسجدوا إلا إبلیس﴾ ئەوانیش هەموو دەست بەجێ فەرمانەکەیان پیادە کردو کرنووشیان برد، (ئیبلیس) نەبێ ﴿كان من الجن ففسق عن أمر ربه﴾، ئەو لە(جن) بوو لە فەرمانی پەروەردگاری خۆی دەرچوو.

تێبینی: لە سوورەتی (بەقەرە)دا شتێکمان لەبارەی (شەیتان)ـە وە باسکرد،دەتوانی بۆ زیادە شارەزابوون بگەڕێیتەوە ئەوێ. ﴿أفتتخذونه وذریته أولیاء من دونی﴾ ئایا ئیتر ئێوە شەیتان و زارۆو نەوەکانی لەباتی من (خوا) دەکەنە دۆست و پشتیوانی خۆتان..؟ کەسێك ئەوهەمووکارە ناپەسەندانەی لێ وەشابێتەوە, ئێستاچۆن دەکرێ بەپشتیوان ﴿وهم لكم عدو﴾ لەحاڵێکا کە ئەوان (خۆی و نەوەی) دوژمنی ئێوەن و،هەمیشە دژایەتیتان دەکەن ﴿بئس للظالمین بدلا﴾ ئای چ گۆڕینەوەیەکی خراپە گوێ رایەڵیی کردنی ناهەقیکاران بۆ شەتیان لەباتی خوا! ﴿٥١ ما أشهدتهم خلق السموات والأرض﴾ ئێمە لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوییدا نەمانکردن بە شایەت وهیچ پرسێکمان پێ نەکردن ﴿ولا خلق أنفسهم﴾ وە بۆ دروستکردنی خوودی خۆشیان هەروا، واتە: ئەوانەش (شەیاتینەکان) هەر وەك ئێوە بێ دەسەڵاتن، دەسا ئیتر چۆن ئێوە بەگوێیان دەکەن ﴿وما كنت متخذ المضلین عضدا﴾ وەمن هەرگیز گومڕاکەران و سەرلێشێواوانم نەکردووە بە دۆست و یاریدەدەری خۆم، هەتا لەوکارەیشدا بیانکەمە یاریدەدەری خۆم، کەوابوو نابێ ئێوەیش بیانکەنە دۆست و پشتیوانی خۆتان ﴿٥٢ ویوم یقول نادوا شركائی الذین زعمتم﴾ ئەو رۆژە وەبیر بێننەوە کە خوا بەهاوەڵدانەرەکان دەفەرموێ و دەپرسێ: بانگ لەوانە بکەن ئێوە لەدنیادا پێتان وابوو شەریك و هاوبەشی منن و، هاوارتان بۆ دەبردن لە کاتی خۆشیی و ناخۆشییدا، دەفەرموون، ئەمرۆ هاواریان بۆ بەرن با بێنە فریاتان و ڕزگارتان بکەن، لەجێگایەکی تردا دەفەرموێ: (ولقد جئتمونا فرادی كما خلقناكم أول مرة وتركتم ماخولناكم وراء ظهوركم وما نری معكم شفعاءكم الذین زعمتم أنهم فیكم شركاؤا..). ﴿فدعوهم فلم یستجیبوا لهم﴾ ئەوانیش کە بانگیان دەکەن و هاواریان بۆ دەبەن وەڵامیان بدەنەوە ﴿وجعلنا بینهم موبقا﴾ وە ئێمەش کەندالێکی دادڕاوی بەربلاومان خستە نێوان خۆیان و خواکانیانەوە کە پێیان نەگەن، بێ لەوەش خۆیان و شوێن کەوتووەکانیشیان دەخەینە ناو ئاگرەوە.

**بت پەرستەکان هیچ وەڵامێ نادەنەوە:**

﴿٥٣ ورأی المجرمون النار﴾ جا لەو رۆژەدا تاوانباران بەچاوی خۆ ئاگری دۆزەخ دەبینن ﴿فظنوا أنهم مواقعوها﴾ دڵنیادەبن و تێدەگەن کە هەر دەخرێنە ناویەوە ﴿ولم یجدوا عنها مصرفا﴾ وئیدی پەناگاو خۆلادانێکیشیان دەست ناکەوێ، تا خۆیان لێ بشارنەوە ﴿٥٤ ولقد صرفنا فی هذا القرآن للناس من كل مثل﴾ بێگومان ئێمە لەم قورئانەدا هەموو جۆرە مەسەل و نەزیلەیەکمان بۆمەردم هێناوەتەوە، هەتا بەباشی لە هەق تێبگەن و، لێرەو لەوێ چواشە نەکرێن ﴿وكان الإنسان أكثر شئ جدلا﴾ کەچی ئینسان لەهەمووشتێك دەمباز ترە,واتە: لە سەر قسە زۆر دەچێ و هەمیشە بەبڕوو بیانووە.

(عەلی کوڕی ئەبو تالیب) دەڵێت:شەوێکیان پێغەمبەر ﷺ هاتە ماڵمان و لەمن وخاتوونە(فاتمە)ی کچیی،پرسی:
ئەوە چۆن شەونوێژ ناکەن؟((الا تصليان؟)) گوتم: ئێمە گیانمان بەدەستی خوایە، ئەگەر بییەوێ هەڵمان دەسێنێت،
جاکە پێغەمبەر(ص) ئەوەی بیست لێیان، دای بە ڕانی خۆیداو چووو فەرمووی: (وكان الإنسان أكثر شيء جدلا)
متفق عليه.﴿٥٥ وما منع الناس أن يؤمنوا إذ جاءهم الهدى﴾ تەنیا شتێ کە بوویە کۆسپ لەبەردەم ئەو خەڵکەدا کە
بڕوا بهێنن کاتێ ئەو قورئانەیان بۆهات لەلایەن خواوە ﴿ويستغفروا ربهم﴾ و لەپەروەردگاریان داوای لێبوردن بکەن
﴿إلا أن تأتيهم سنة الأولين﴾ هەرئەوە بوو کە: چاوەنواڕ بوون تووشی چارەنووسی پێشووەکان ببن، کە ئەوان –
پاش ململانێ لەگەڵ پێغەمبەرەکانیاندا– تیاچوون ﴿أو يأتيهم العذاب قبلا﴾ یان ڕوو بەڕوو سزایان بۆ بێت و

الجزء الخامس عشر — سورة الكهف

وَلَقَدْ صَرَّفْنَا فِي هَٰذَا الْقُرْآنِ لِلنَّاسِ مِن كُلِّ مَثَلٍ ۚ وَكَانَ
الْإِنسَانُ أَكْثَرَ شَيْءٍ جَدَلًا ﴿٥٤﴾ وَمَا مَنَعَ النَّاسَ أَن يُؤْمِنُوا
إِذْ جَاءَهُمُ الْهُدَىٰ وَيَسْتَغْفِرُوا رَبَّهُمْ إِلَّا أَن تَأْتِيَهُمْ سُنَّةُ
الْأَوَّلِينَ أَوْ يَأْتِيَهُمُ الْعَذَابُ قُبُلًا ﴿٥٥﴾ وَمَا نُرْسِلُ الْمُرْسَلِينَ
إِلَّا مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ ۚ وَيُجَادِلُ الَّذِينَ كَفَرُوا بِالْبَاطِلِ
لِيُدْحِضُوا بِهِ الْحَقَّ ۖ وَاتَّخَذُوا آيَاتِي وَمَا أُنذِرُوا هُزُوًا ﴿٥٦﴾ وَمَنْ
أَظْلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِآيَاتِ رَبِّهِ فَأَعْرَضَ عَنْهَا وَنَسِيَ مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُ ۚ
إِنَّا جَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ وَفِي آذَانِهِمْ وَقْرًا ۖ
وَإِن تَدْعُهُمْ إِلَى الْهُدَىٰ فَلَن يَهْتَدُوا إِذًا أَبَدًا ﴿٥٧﴾ وَرَبُّكَ
الْغَفُورُ ذُو الرَّحْمَةِ ۖ لَوْ يُؤَاخِذُهُم بِمَا كَسَبُوا لَعَجَّلَ لَهُمُ
الْعَذَابَ ۚ بَل لَّهُم مَّوْعِدٌ لَّن يَجِدُوا مِن دُونِهِ مَوْئِلًا ﴿٥٨﴾
وَتِلْكَ الْقُرَىٰ أَهْلَكْنَاهُمْ لَمَّا ظَلَمُوا وَجَعَلْنَا لِمَهْلِكِهِم
مَّوْعِدًا ﴿٥٩﴾ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِفَتَاهُ لَا أَبْرَحُ حَتَّىٰ
أَبْلُغَ مَجْمَعَ الْبَحْرَيْنِ أَوْ أَمْضِيَ حُقُبًا ﴿٦٠﴾ فَلَمَّا بَلَغَا
مَجْمَعَ بَيْنِهِمَا نَسِيَا حُوتَهُمَا فَاتَّخَذَ سَبِيلَهُ فِي الْبَحْرِ سَرَبًا ﴿٦١﴾

٣٠٠ — فَلَمَّا جَاوَزَا

بەچاوی سەر ببینن، ئەگینا ئەوان کە ئەو هەموو بەڵگەو
نیشانانەیان نیشان دەدرێ , بۆچی باوەڕ ناهێنن؟ ئەوەبوو
هێندێکیان بە پێغەمبەرەکەیانیان دەگوت: (فأسقط علينا
كسفا من السماء إن كنت من الصادقين). ﴿٥٦ وما نرسل
المرسلين إلا مبشرين ومنذرين﴾ وەپەیامبەرانمان نەناردووە
بۆ خەڵکی بە مژدەر (بە بەهەشت بۆ ئیمانداران) و بە
ترسێنەر (بە دۆزەخ بۆ بێباوەڕان) نەبێ ﴿ويجادل الذين
كفروا بالباطل﴾ کەچی لەگەڵ ئاشکرایی هەق و ڕاستییدا
کافرو بێ باوەڕان، هەمیشە دەمەدەم دەکەن لەگەڵ
موسڵمانەکاندا ﴿ليدحضوا به الحق﴾ بۆ ئەوەی بەگومانی
خۆیان هەق و ڕاستیی پێ لەناو بەرن و زاڵ بن بەسەریا،
خۆ قەت ئەوەیان بۆ مەیسەر نابێت ﴿واتخذوا آياتي وما
انذروا هزوا﴾ وە لە باتی باوەڕ هێنان ئایەتەکانی ئێمە و ئەو
سزایە وا ئەوانی پێ ترسێنران، بەگاڵتەجاڕیان وەرگرت و
کەوتنە مەسخەرە پێیان!

**دەبێ کێ لە هەموو کەسێك ستەمکارتر بێت؟**

﴿٥٧ ومن اظلم ممن ذكر بآيات ربه﴾ دەبێ کێ لەوکەسە
ستەمکار تربێت کە بە ئایەتەکانی پەروەردگاری (واتە:بە قورئان) ئامۆژگاری بکرێ ﴿فأعرض عنها﴾ کەچی ڕوویان
لێ وەرچەرخێنێ ﴿ونسي ما قدمت يداه﴾و ئاکامیئەوکارەخراپانەیش کە بەدەستیی خۆی پێشی خستوون لە بیر
کردبێ! ﴿إنا جعلنا على على قلوبهم اكنة أن يفقهوه﴾ بەڕاستیی بەهۆی کوفرو لاسارییانەوە، پەردەمان بەسەر
دڵیاندا هێنا، هەتا لە ماناو مەبەستی باوەڕ تێ نەگەن و کەڵکی لێ وەرنەگرن ﴿وفي آذانهم وقرا﴾ وە گوێشیانمان
ئەوەندە قورس و گران کرد کە نەتوانن هەق ببیسن، چونکە خۆیان نایانەوێ بیبیسن، ئێمەش زۆریان لێ ناکەین
﴿وإن تدعهم إلى الهدى﴾ خۆ ئەگەر هەوڵی زۆریان لەگەڵبدەیت و بانگیان بکەیت بۆ هیدایەت و ڕێنوێن بوونی ڕێی
ڕاست ﴿فلن يهتدوا إذا ابدا﴾ ئیترهەرگیز ڕێنوێن نابن و وەڵام نادەنەوە، چونکە خۆ تێناگەیەنن و نابیسن!! ﴿٥٨
وربك الغفور ذو الرحمة﴾ پەروەردگاریشت ئەی پێغەمبەر! ﷺ زۆر لێبوردەی، خاوەن میهرەبانیی و ڕەحمەتە لەگەڵ

سەرپێچیکەرانیشدا، ئەوەتە لە تۆڵەی گوناحەکانیاندا زوونایانگرێت ﴿لو يؤاخذهم بما كسبوا﴾ و خۆئەگەر بیانگرێت بە هۆی کارو کردەوە خراپەکانیانەوە ﴿لعجل لهم العذاب﴾ دەبوو گورج سزای دابان ﴿بل لهم موعد﴾ بەڵام واناکات، چونکە دەم و ساتی جەزرەبەیانی دیاریکردووە ﴿لن يجدوا من دونه موئلا﴾ کاتێ ئەوەش هات ئیدی هیچ پەناگاو ڕێ هەڵهاتنێکیان دەست ناکەوێ،هە تا خۆیانی لێ بشارنەوە ﴿٥٩ وتلك القرى اهلكناهم لما ظلموا﴾ وە خەڵکی ئەم شارو گوندانەشمان: (هۆزەکەی هودو، صالح و، شوعەیب.. هتد) لەناوبردن کاتێ ستەمیانکرد ﴿وجعلنا لمهلكهم موعدا﴾ وەبۆ لەناوبردنیشیان سات و کاتێکمان بۆ دانان، ئاخۆ تۆ بڵێیت پەندی لێ وەربگرن؟.

**داستانەکەی مووسا و خدر سلاَویان لەسەر بێت:**

بەڵێ خوای باڵادەست موسا ئاگادار دەکات کە لە(مەجمەعولبەحرەین دا)(واتە: - وەك قەتادە دەڵێ- دەریای فارس و، دەریای رۆم) بەندەیەکم هەیە گەلێ زانست و زانیاریی لایە، ئینجا مووسایش لەبەر پتر فێربوونی زانست، وای بەچاك زانی بڕوا بۆلای و، جێگەکەشی بۆ دیارییکراو (ماسی)یەکی بێ گیانیشیان لەگەڵ خۆیان برد و پێیان وترا: لەهەر جێگایەك ئەوماسیەیە بزووت و زیندوو بوویەوە،زاناکە لەو جێگەیەدایە، (مووسا)ش بە (یوشەع)ی غوڵام و هاوەڵیی خۆی گوت: کە گەیشتینە ئەوجێگا دیارییکراوە بۆمان،دەبێ زوو ئاگادارم بکەیت، بەڵام شەیتان لە بیری دەباتەوە!! (فەتا) لەبنەڕەتا بەلاو دەڵێن، عەرەبیش بەخزمەتکاردەڵێت (فەتا)، چونکە بەپێی باوی گشت ناوچەیەك، هەوڵدەدرێ کەسێك بکرێ بەخزمەتگوزار کە لەساڵەکانی لاویەتییدا بێت، شیاوی باسە (یوشع)یش موسای زۆر خۆش دەویست و، زۆریش هەوڵی سەربەرزیی و سەرفرازیی بۆ دەدا، هەر بۆیە مووسایش ئەوی کردە هاوەڵ وهاوڕیی خۆیی و، پاش خۆیشی بووە سەرکردەی (بەنی ئیسرائیل) و (بیت المقدس)ی لەدەستی تاقمە زۆردارەکانی سەردەمدا سەندەوە، ئەمە بەشێکبوو لە واتاومانای فەرموودەیەك کە ئیمامی (بوخاریی) هێناویەتی لە کتێبە ڕاستەکەیدا. وەهەروا ئیمامی (موسلیم)یش هێناویەتیی‌و دەڵێت: خوای گەورە بەمووسای فەرموو: بۆ ئەو مەبەستە دەبێ ماسییەك لەگەڵ خۆت ببەیت، جا لەکوێ لێت گوومبوو، ئەوە (خدر) لەوێیە، بەڵێ ئەویش فەرمانەکەی خوای جێبەجێ کردو ڕۆیشتن تا گەیشتنە لای بەردێك، ئەوجا مووسا دەستی کرد بەگەڕان بەدوای (خدر)داو پێیوا بوو لەو دەورو بەرەدایە، لاوەکەش ماسییەکەی لەسەر بەردەکە دانا و جووڵەجوڵێکی دەست پێکردو لەپڕێکا چووە ناو دەریاکەوە، لاوەکە وتی: هەرکە مووسا هاتەوە پێی دەڵێم، کەچی کاتێ مووسا گەڕایەوە، شەیتان لەبیری بردەوە ڕووداوەکەی بۆ باسبکا! ئەمەیە کە خوا دەفەرموێ: ﴿٦٠ وإذ قال موسى لفتاه﴾ وە ئەوکاتە وەبیربێنە ئەی پێغەمبەر!ﷺ کە(موسای کوڕی عیمران) بەهاوڕێ و لاوەکەی خۆی (یوشەعی کوڕی نون ی کوڕی یوسف)ی گوت: ﴿لا ابرح حتى ابلغ مجمع البحرين﴾ من لێبڕاوم سەفەرێ بکەم و نەگەڕێمەوە هەتا ئەگەمە جەمسەری بەیەك گەیشتنی هەردوو دەریاکە کە لە(محیطی هیندی) و لەدەریای (سوور) لە (باب المندب)دا یەك دەگرنەوە ﴿او امضى حقبا﴾ یاخود هێمان هەر ماوەیەکی زۆرتریش بچم، هەتا دەگەمە مەبەست ﴿٦١ فلما بلغا مجمع بينهما﴾ ئینجا کە گەیشتنە جەمسەری هەر دوو دەریاکە کە جێگەی مەبەستە کەیانبوو ﴿نسيا حوتهما﴾ هەردووکیان ماسی یەکەیان لەبیرچوو! ﴿فاتخذ سبيله في البحر سربا﴾ ئەویش -ماسی یەکە- بە هەڵبڵۆقاویی و هەڵبەزینەوە خۆی گەیاندە دەریاکە ﴿٦٢ فلما جاوزا﴾ ئینجا کە موساو هاوڕێکەی لە جێی تێکەڵبوونی دووئاوەکە دەرباز بوون و تێپەڕیین ولە جیێەکی ترلایاندا ﴿قال آتنا غداءنا﴾ موسا بە لاوەکەی خۆی گوت: ئادەی خواردنەکەمان بێنە، دیارە دەمێك بوو بە ڕێوە بوون برسیان ببوو ﴿لقد لقينا من سفرنا هذا نصبا﴾ بە ڕاستیی لەم سەفەرەدا ماندوویی زۆرمان

دیت، دیارە ئەمەیش هەر نەخشەی خوایە کەلەو جێگایەدا ماندوو بن و برسییان ببێت و ماسی یەکەشیان بیر بکەوێتەوە!! ﴿٦٣ قال ارایت إذ اوینا إلی الصخرة﴾ لاوەکە بە موسای گوت: ئەرێ دەزانیی چی روویدا؟! هەر ئەوکاتە کە چووینە پەنای بەردە گەورەکەو ئەو پشوویەمان دا ﴿فإنی نسیت الحوت﴾ بەڕاستی من ماسییەکەم لەبیر چوو، بۆتی باس بکەم کە: هەر لەوێ زیندوو بوویەوەو خۆی کوتایە ناو دەریاکەو ڕۆیشت،! ﴿وما انسانیه إلا الشیطان ان اذکره﴾ دیارە هەر شەیتانیش لەبیری بردمەوە بۆتی بگێڕمەوە ﴿واتخذ سبیله في البحر عجبا﴾ وەلەلای بەردەکە ماسی یەکە بە شێوەیەکی زۆر سەیرو سەمەرە هەڵبەزییەوەو ڕێگەی دەریاکەی گرتە بەر و ڕۆیشتە ناویەوە ﴿٦٤ قال ذلك ما کنا نبغ﴾ موساش وتی: ئێمەش هەر شتێکی وامان دەویست ﴿فارتدا علی آثارهما قصصا﴾ ئینجا بەچاوگێڕان بە ڕێی خۆیان دا گەڕانەوە بۆ ئەو شوێنە بە جێیان هێشتبوو ﴿٦٥ فوجدا عبدا من عبادنا﴾ ئەوجا لە نزیک بەردەکەوە بە بەندەیەك لە بەندەکانی ئێمە ئاشنا بوون. جەماوەری زانایان دەڵێن: ئەو بەندەیە (خدر) بووەو، (نەبی)ش بووە، بەڵام ئایا ئێستاکە زیندووەو بەسەر زەویەوە ئەژی — وەك دەڵێن خدری زیندە؟ ئەوە کۆمەڵێکی زۆریان بەم چەند بەڵگەیە پێیان وایەکە ئێستا زیندوو نییەو نەماوە، یەکەم: لەبارەی (خدر)و(ئیلیاس) وە لەئیمامی (بوخاریی) پرسیار کرا: ئایا ئێستا هەردوو زیندوون وەکو دەڵێن؟! ئەویش گوتی: چۆن زیندوون، لەکاتێکا پێغەمبەر ﷺ کەمێ بەر لەمردنی خۆی فەرموویەتی: ((لایبقی علی رأس المائة ممن هو الیوم علی ظهر الارض أحد)). دووەم: ئەم فەرموودە کەئیمامی (موسلیم) هێناویەتی ودەڵێت: ((مامن نفس منفوسة یأتی علیها مائة سنة وهی یومئذ حیة)). هەر بۆیە (ئیبن تەیمییە)ش دەڵێ: (ئەگەر خدر زیندو بووبا،دەبوو بهاتبایە لای پێغەمبەرو جیهادی لەتەك کردبا، درێژەی ئەم باسە لە تەفسیری (روح المعانی)دایە. ﴿آتیناه رحمة من عندنا﴾ کەلە بەزەیی و میهرەبانیی خۆمان بەهرەوەرمان کرد بوو ﴿وعلمناه من لدنا علما﴾ و زانست و زانیاریی تایبەتیشمان لە خۆمانەوە کەپێی دەڵێن (عیلمی لەدونی) فێرکردبوو.

سُورَةُ الكَهْفِ — الجزء الخامس عشر

فَلَمَّا جَاوَزَا قَالَ لِفَتَىٰهُ ءَاتِنَا غَدَآءَنَا لَقَدْ لَقِينَا مِن سَفَرِنَا
هَٰذَا نَصَبًا ﴿٦٢﴾ قَالَ أَرَءَيْتَ إِذْ أَوَيْنَآ إِلَى ٱلصَّخْرَةِ فَإِنِّى نَسِيتُ
ٱلْحُوتَ وَمَآ أَنسَىٰنِيهُ إِلَّا ٱلشَّيْطَٰنُ أَنْ أَذْكُرَهُۥ وَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ
فِى ٱلْبَحْرِ عَجَبًا ﴿٦٣﴾ قَالَ ذَٰلِكَ مَا كُنَّا نَبْغِ فَٱرْتَدَّا عَلَىٰٓ ءَاثَارِهِمَا
قَصَصًا ﴿٦٤﴾ فَوَجَدَا عَبْدًا مِّنْ عِبَادِنَآ ءَاتَيْنَٰهُ رَحْمَةً مِّنْ
عِندِنَا وَعَلَّمْنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا ﴿٦٥﴾ قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰ هَلْ أَتَّبِعُكَ
عَلَىٰٓ أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا ﴿٦٦﴾ قَالَ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ
مَعِىَ صَبْرًا ﴿٦٧﴾ وَكَيْفَ تَصْبِرُ عَلَىٰ مَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ خُبْرًا ﴿٦٨﴾ قَالَ
سَتَجِدُنِىٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ صَابِرًا وَلَآ أَعْصِى لَكَ أَمْرًا ﴿٦٩﴾ قَالَ
فَإِنِ ٱتَّبَعْتَنِى فَلَا تَسْـَٔلْنِى عَن شَىْءٍ حَتَّىٰٓ أُحْدِثَ لَكَ مِنْهُ ذِكْرًا
﴿٧٠﴾ فَٱنطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَا رَكِبَا فِى ٱلسَّفِينَةِ خَرَقَهَا قَالَ أَخَرَقْتَهَا
لِتُغْرِقَ أَهْلَهَا لَقَدْ جِئْتَ شَيْـًٔا إِمْرًا ﴿٧١﴾ قَالَ أَلَمْ أَقُلْ إِنَّكَ
لَن تَسْتَطِيعَ مَعِىَ صَبْرًا ﴿٧٢﴾ قَالَ لَا تُؤَاخِذْنِى بِمَا نَسِيتُ وَلَا
تُرْهِقْنِى مِنْ أَمْرِى عُسْرًا ﴿٧٣﴾ فَٱنطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَا لَقِيَا غُلَٰمًا فَقَتَلَهُۥ
قَالَ أَقَتَلْتَ نَفْسًا زَكِيَّةًۢ بِغَيْرِ نَفْسٍ لَّقَدْ جِئْتَ شَيْـًٔا نُّكْرًا ﴿٧٤﴾

٣٠١

جا لەبارەی (علم اللدنی)یەوە، (شێخ عبدالوهابی شەعرانیی) دەڵێ: (وأما زبدة علم التصوف الذی وضع القوم فیه رسائلهم فهو نتیجة العمل بالکتاب والسنة، فمن عمل بما علم تکلم بما تکلموا، وصار جمیع ما قالوه بعض ماعنده، لأنه کلما ترقی العبد فی باب الأدب مع الله تعالی دق کلامه علی الإفهام). واتە: کاکڵەو پوختەی (تەصەوف) کارکردنە بە(قورئان)و(سوننەت)ی پێغەمبەر ﷺ، ئەوانەش کە ئەو قسانەیان لێدەگێڕنەوە، دیارە کاریان بەو قورئان و فەرموودەیە کردووە کەفێری بوون، وە ئەوەی گوتویانە هێشتا هەر هەندێکی بووە، چونکە هەر بەندەیەك کە بە

پەیڕەی ئەدەب و ویڵدا قسە لەگەڵ خوادا بکاو سەرکەوێ، بێگومان وتەو گفتوگۆیشی زۆر ورد دەبێ و، هەمووکسێکیش لێی تێناگات. سەیرێکی تەفسیری (ئالوسیی)بکە.

﴿[٦٦] قال له موسى هل اتبعك﴾ موسا ﷺ پێیگوت: ئاخۆ مۆڵەتم دەدەیت شوێنت بکەوم؟ واتە: ڕوخسەتم ئەدەیت کە بەردەوام لەگەڵت بم؟﴿على أن تعلمن مما علمت رشدا﴾ تا لەو زانستەی- لەلایەن پەروەردگارتەوە- فێرکراویت، منیش فێر بکەیت و نیشانمی بدەی، بەڵکو کەڵکی لێ وەرگرم لە کاروبارمدا ﴿[٦٧] قال إنك لن تستطيع معي صبرا﴾ خدر وتی: بەڕاستی تۆ هەرگیز لەگەڵ من هەڵناکەیت، ناتوانی خۆ ڕاگربیت لەبەرامبەر ئیشەکانی منەوە،چونکە هەندێ شت دەبینی لەمنەوە، بەرواڵەت لەگەڵ شەریعەتەکەی تۆدا ناگونجێ ﴿[٦٨] وكيف تصبر على مالم تحط به خبرا﴾ وە چۆن لەئاست شتێکدا ئاگات لە بنج و بناوانی نەبێ و، لەڕواڵەتیشدا بە کارێکی ناپەسەند دیاربێت، چۆن دەردەبەی دەنگ نەگەیت، ئەگەرچی لە (غەیب)یشدا حیکمەتی زۆری تیابێ ﴿[٦٩] قال ستجدني إن شاء الله صابرا﴾ موسا بە خدری گوت: ئەگەر خوا حەزبکا بەخۆڕاگر دەمبینیت هەتا لەگەڵتابم ﴿ولا اعصى لك امرا﴾ و لەهیچ فەرمانێکی تۆ سەرپێچی ناکەم ﴿[٧٠] قال فإن اتبعتني﴾ خدر وتی: جا ئەگەر قبوڵتەو بەدوامدا دێیت ﴿فلا تسألني عن شئ﴾ لە حیکمەتی هیچ شتێك پرسیارم لێ مەکە ﴿حتى أحدث لك منه ذكرا﴾ تا خۆم لەکاتی خۆیدا قسەت بۆ دەکەم و لەنهێنیەکەی ئاگادارت دەکەم.

**کونکردنی گەمییەکە!**

﴿[٧١] فانطلقا حتى إذا ركبا في السفينة خرقها﴾ ئینجا هەردوو پێکەوە ڕۆیشتن تاکاتێ سواری کەشتیەکە بوون و، خدر کونی تێکردو عەیبداری کرد ﴿قال: اخرقتها لتغرق اهلها﴾ موسا خۆی پێنەگیراو بەسەرسوڕمانێکەوە وتی: ئاخۆ تۆ ئەم کەشتییە کون دەکەیت، هەتا هەموو سەرنشینەکانی نقوم کەیت؟! ﴿لقد جئت شيئا إمرا﴾ بەڕاستیی کارێکی بەدفەڕوو ناشایستەت کرد ﴿[٧٢] قال الم اقل إنك لن تستطيع معي صبرا﴾ خدر گوتی: مەگەر پێشتر پێمنەگوتی تۆ هەرگیز ناتوانی لەگەڵ من خۆ ڕابگریت؟ ﴿[٧٣] قال لا تؤاخذني بما نسيت﴾ مووسا گوتی: لەمە لەبیرم چوو لێم مەگرە ﴿ولا ترهقني من امري عسرا﴾ وە لەفێربوونی ئەوزانیارییەدا کە دەمەوێ لەتۆوە فێربم، سەختگیریم لەگەڵ مەکە، لەفەرموودەیەکیشدا هاتووە: ((كانت الأولى من موسى نسيانا)) فتح الباري: ٨/ ٢٢٨.

**کوشتنی کوڕە لاوەکە!**

﴿[٧٤] فانطلقا حتى إذا لقيا غلاما فقتله﴾ بەڵێ ئەمجارەش پۆزشەکەی لێ وەرگرت و پاشان لەکەشتییەکە دابەزین و ڕۆیشتن تا لەڕێگەدا بەکوڕێکی تازەلاو گەیشتن و خدر کوشتیی!! ﴿قال اقتلت نفسا زكية بغير نفس﴾ موسا وتی: سەیرە! ئایاکەسێکی پاکی بێ گوناهت کوشت، بێ ئەوەی کەسێکی کوشتبێت؟! ﴿لقد جئت شيئا نكرا﴾ بەڕاستیی کارێکی زۆر گەورەی ناپەسەندت ئەنجامدا، چونکە هێمان کونکردنی کەشتیەکە سووکتر بوو، تا کوشتنی ئەو لاوە بێ تاوانە.

کۆتایی جزمی پازدەیەم

ولله الحمد والمنة

*** *** ***

* ﴿٧٥ قال ألم أقل لك إنك لن تستطيع معى صبرا﴾ خدر وتی: ئەی پێم نەگوتی هەرگیز تۆ ناتوانی لەگەڵ من ئارام بگری و هەڵبکەیت؟ چونکە من هەندێ شت ئەکەم, بەرواڵەت لەکاری ناپەسەندو نابەجێ دەچن, بەڵام لە واقیعدا شتێکی نهێنیی گرنگی لەبندایە ﴿٧٦ قال إن سألتك عن شئ بعدها فلا تصاحبنى﴾ موسا وتی: دەسا ئەگەر دوای ئەمە جارێکی تر پرسیاری هەرشتێکم لێکردی و رەخنەم لێگرتیت, ئیتر هاوڕێیەتیم مەکە ﴿قد بلغت من لدنى عذرا﴾ ئیتر بەڕاستی مافی خۆتە، و لەلایەن منیشەوە بیانووی جیابوونەوەت دەست کەوتووە, منیش گلەیی و بیانووم نامێنێ.

**سەرگروشتەی راستکردنەوەی دیوارەکە:**

سُورَةُ الكَهۡفِ — الجُزۡءُ السَّادِسَ عَشَرَ

﴿ قَالَ أَلَمۡ أَقُل لَّكَ إِنَّكَ لَن تَسۡتَطِيعَ مَعِيَ صَبۡرٗا ﴿٧٥﴾ قَالَ إِن سَأَلۡتُكَ عَن شَيۡءِۭ بَعۡدَهَا فَلَا تُصَٰحِبۡنِيۖ قَدۡ بَلَغۡتَ مِن لَّدُنِّي عُذۡرٗا ﴿٧٦﴾ فَٱنطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَآ أَتَيَآ أَهۡلَ قَرۡيَةٍ ٱسۡتَطۡعَمَآ أَهۡلَهَا فَأَبَوۡاْ أَن يُضَيِّفُوهُمَا فَوَجَدَا فِيهَا جِدَارٗا يُرِيدُ أَن يَنقَضَّ فَأَقَامَهُۥۖ قَالَ لَوۡ شِئۡتَ لَتَّخَذۡتَ عَلَيۡهِ أَجۡرٗا ﴿٧٧﴾ قَالَ هَٰذَا فِرَاقُ بَيۡنِي وَبَيۡنِكَۚ سَأُنَبِّئُكَ بِتَأۡوِيلِ مَا لَمۡ تَسۡتَطِع عَّلَيۡهِ صَبۡرًا ﴿٧٨﴾ أَمَّا ٱلسَّفِينَةُ فَكَانَتۡ لِمَسَٰكِينَ يَعۡمَلُونَ فِي ٱلۡبَحۡرِ فَأَرَدتُّ أَنۡ أَعِيبَهَا وَكَانَ وَرَآءَهُم مَّلِكٞ يَأۡخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصۡبٗا ﴿٧٩﴾ وَأَمَّا ٱلۡغُلَٰمُ فَكَانَ أَبَوَاهُ مُؤۡمِنَيۡنِ فَخَشِينَآ أَن يُرۡهِقَهُمَا طُغۡيَٰنٗا وَكُفۡرٗا ﴿٨٠﴾ فَأَرَدۡنَآ أَن يُبۡدِلَهُمَا رَبُّهُمَا خَيۡرٗا مِّنۡهُ زَكَوٰةٗ وَأَقۡرَبَ رُحۡمٗا ﴿٨١﴾ وَأَمَّا ٱلۡجِدَارُ فَكَانَ لِغُلَٰمَيۡنِ يَتِيمَيۡنِ فِي ٱلۡمَدِينَةِ وَكَانَ تَحۡتَهُۥ كَنزٞ لَّهُمَا وَكَانَ أَبُوهُمَا صَٰلِحٗا فَأَرَادَ رَبُّكَ أَن يَبۡلُغَآ أَشُدَّهُمَا وَيَسۡتَخۡرِجَا كَنزَهُمَا رَحۡمَةٗ مِّن رَّبِّكَۚ وَمَا فَعَلۡتُهُۥ عَنۡ أَمۡرِيۚ ذَٰلِكَ تَأۡوِيلُ مَا لَمۡ تَسۡطِع عَّلَيۡهِ صَبۡرٗا ﴿٨٢﴾ وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَن ذِي ٱلۡقَرۡنَيۡنِۖ قُلۡ سَأَتۡلُواْ عَلَيۡكُم مِّنۡهُ ذِكۡرًا ﴿٨٣﴾

٣٠٢ — إِنَّا مَكَّنَّا لَهُۥ

﴿٧٧ فانطلقا حتى إذا أتيا أهل قرية﴾ هەردوو پێکەوە ڕۆیشتن تاگەیشتنە خەڵکی شارێك, دیارە بۆ دیاری کردنی ئەوشارە لەناو مێژوونووسەکاندا کێشە هەیە, ئەگەرچی هەندێ ئەڵێن: شاری (ئەنتاکییە)ی ئێستای سەر بە وڵاتی سووریە بوو ﴿استطعما أهلها﴾ داوای خۆراك و خواردەمەنیان لێکردن، هەروەك میوانێك رووبکاتە جێگایەك و برسی بێ ﴿فأبوا أن يضيفوهما﴾ ئەوانیش میواندارییان نەکردن, چونکە خەڵکێکی رژد وچرووك و پیسکە بوون ﴿فوجدا فيها جدارا﴾ جا دیوارێکیان لەوێ بەدیکرد ﴿يريد أن ينقض فأقامه﴾ خەریکبوو بکەوێ، بەڵام خدر هەڵی چنیەوەو راستیکردەوە ﴿قال لو شئت لأتخذت عليه اجرا﴾ موسا وتی: ئەگەر ئارەزووت بووبا بۆچاککردنەوەی ئەو دیوارە کرێیەت وەرئەگرت ﴿٧٨ قال هذا فراق بينى وبينك﴾ خدر وتی: ئەوا ئێستا بەپێی قسەی خۆت لەیەك جیادەبینەوە ﴿سأنبئك بتأويل مالم تستطع عليه صبرا﴾ کەمێکی تر حیکمەت و نهێنی ئەو رووداوانەت بۆ باسدەکەم, لەبەرامبەریانەوە بێ ئارام بوویت.

**بەسەرهاتی گەمیەکە:**

﴿٧٩ اما السفينة فكانت لمساكين يعملون في البحر﴾ هۆی کونکردنی کەشتییەکە, ئەمەبوو کە هی چەند کەسێکی هەژارو بێنەوا بوو، لەدەریادا ئیشیان پێدەکرد بۆبژێوییان ﴿فأردت ان اعيبها﴾ بۆیە ویستم بە کونکردنی عەیبداری بکەم ﴿وكان وراءهم ملك يأخذ كل سفينة غصبا﴾ چونکە لەپێشیانەوە پاشایەکی ستەمکار هەبوو، هەموو کەشتییەکی چاك و بێ عەیبی زەوت دەکرد.

**کوشتنی خوڵامەکە:**

﴿٨٠ وأما الغلام فكان أبواه مؤمنين﴾ تا زەلاوەکەش (کەکوشتم)! دەمزانی کەسروشتی لەسەر بێبڕوایی و خوانەناسیی ئەڕواو, باوك و دایکیشی ئیماندارو موسڵمان بوون ﴿فخشينا ان يرهقهما طغيانا وكفرا﴾ جا ئێمەش

ترساین بەسەرکەشی خۆی هەردوو لەخشتە بەرێ و ناچاریان بکات و هەڵیان بنێ بەرەو سەرکەشی و بێ برِوایی ﴿٨١ فأردنا ان یبدلهما ربهما خیرا منه زکاة واقرب رحما﴾ ویستمان بەوکارەیە پەروەردگاریان بۆیان بگۆڕێ بەمنداڵێکی چاکترو پاکترو بە میهرەبان تر.

## رووخاندنی دیوارەکەو چاککرنەوەی:

﴿٨٢ واما الجدار فکان لغلامین یتیمین فی المدینة﴾ دیوارەکەیش کە خەریك بوو ئەکەوت و ئێمەش بەخۆڕایی چاکمان کردەوەماڵی دووکوڕە بچکۆلەی هەتیو بوو لە شارەکەدا ﴿وکان تحته کنز لهما﴾ لەژێریا گەنجینەیەك هەبووکە هی ئەو دوومنداڵە هەتیوە بوو، باوکیان بۆی دانابوون ﴿وکان ابوهما صالحا﴾ و باوکیشیان خواناس و پیاوچاك بوو, جا لەبەرخاتری بابیان, خوا پارێزگاری بۆکردبوون، بۆیە ئێمەش ئەو کارەمانکرد, وتمان نەوەك لافاوێ دەری بخاو بفەوتێ. راڤەکەرانی قورئان ئەڵێن: چاکیی و راستیی باوك، سوود بەنەوەکانی دەگەیەنێت, ئەگەر موسڵمان بن. ﴿فأراد ربك ان یبلغا اشدهما﴾ پەروەردگارت ویستی ئەودووانە کاتێ گەنجینەکەیان دەستکەوێتەوە بگەنە تەمەنی بلوغ و بەهێزبوون ﴿ویستخرجا کنزهما﴾ و ئەوسا خەزێنەی خۆیان لەژێر دیوارەکەدا دەربێنن ﴿رحمة من ربك﴾ ئەمەیش بەزەیی و میهرەبانییەك بوو لەلایەن پەروەردگارتەوە بەرامبەر بەودوو کوڕە چکۆلەیە کردی لەبەر چاکی باوکیان ﴿وما فعلته عن امری﴾ دڵنیاشبە لەخۆمەوە نەمکردووە, بەڵکو گشت بەفەرمانی خوا بووە ﴿ذلك تاویل مالم تسطع علیه صبرا﴾ ئەوە روونکردنەوەی ئەوشتانە بوو کەتۆ نەتوانی بەرامبەریان خۆراگر بیت. (تەبەری) ئەڵێت: گێرانەوەی ئەم چیرۆکەو, چیرۆکەکەی (موسا) و (یوشع)ی هاورێیشی, هەر بۆئەوەیە پەیامبەریش ﷺ بۆ سزادانی هاوبەشدانەران وگاڵتەکەران بەخۆیێ و بەقورئانەکەی پەلە نەکات. داستانی موساو خدر وەك لە(بوخاری) و (موسلیم)دا هاتووە بەم شێوەیە بووە: (ئوبەی) ئەڵێت: پەیامبەر ﷺ فەرمووی: جارێکیان موسا لەناو بەنی ئیسرائیلدا وتاری ئەدا، جا لەودەمەدا لێیان پرسی: کێ لە هەموو کەس زاناترە؟ وتی: من, ئینجا لەبەر ئەوە کە نەیوت خوا ئەزانێ، خواش لێی بەگلەیی هات و، نیگای بۆ کردکە لە (مجمع البحرین)دا بەندەیەکی ساڵح وراساڵم هەیە، ئەو بەندەیەم لە تۆ زاناترە، موسا وتی: خوایا! من چۆن پێیبگەم؟ جاهەر، بەوشێوەیە کەقورئان باسی لێوەکرد، پەیامبەریش ﷺ روونیکردەوە، بەڵام ئاخۆ خدر کێبێت؟ لە چ سەردەمێکا ژیابێ؟ پێغەمبەر بووبێ؟ یاخود پیاوێکیسالح؟ ئاخۆ ئێستا زیندووبێ؟ یان مردوو؟ جابۆ هەریەکە لەوپرسیارانە جیاوازیی وکێشەیەکی زۆرهەیە، هەرچەندە جەماوەری زانایان دەڵێن: پێغەمبەر نەبووە، ئەگەر چی (شنقیتی) بەلایەوە پێغەمبەر بووە، قسەی راستیش هەرئەوەیە کەئێستا لەژیاندا نەماوەو هەرلەکاتی خۆیدا مردووە، (ئیبنی کەسیر) دەڵێ: هەرفەرموودەیەك لەبارەی ژین وزیندوویێتی (خدر)ەوە هاتبێ لاوازە، هەروەها (ئیبنی حەجەر) یش زۆرێك لەوفەرموودانەی لاواز کردووە. (أضواء البیان)یش دەڵێ: ئەو رەحمەت و (عیلمە لەدونی)یە خوا بەویدا، بەپێی ئایەتی (وما فعلته عن أمری) لەرێی وەحییەوەبوو، چونکە هیچ رێیەکیتر جگە لەوەحیی حوکم و بریاری لێوەرناگیرێ و، بینای حوکمی هیچ شتێکی لەسەرناکرێ، بەتایبەتی کوشتنی خەڵکێکی بێ تاوان، جاکەوابوو خدر پێغەمبەر بووە، بەڵێ منیش هەرئەمەی (شنقیتی)م بەلاوە لەهەقەوە نزیکترە، خوایش باشتر دەزانێ.

**لەم داستانەدا:**

١- دەبێ هەمیشە هەوڵبدرێ رابەرێکی زیرەك وهۆشمەند دابنرێت، سوودیش لە ژیریی و زانستەکەی وەربگیرێ هەر وەکو موسا ﷺ هەوڵیداو کەوتە شوێن ئەوزانا بەرێزە، دیارە ئەمە سەرمەشقە بۆ هەمووکەسێك لەهەر پایەوپلەیەکی زانیارییدا هەبێت، وە لەهەر تەمەن وساڵێکدا بێتن دەبێ بەدوای زاناو کەڵەپیاواندا بگەرێ ولێیان بەهرەمەند ببێ.

٢- کاکڵەی زانستیی راستەقینەی خوایی هەرلەبەندایەتیی وخواپەرستنەوە سەرچاوە دەگرێ.

٣- فێربوونی زانیاریی دەبێ بۆکارپێکردن بێت، چونکە موسا ﷺ بەماموستاکەی خۆی وت: ((مما علمت رشدا)) واتە: زانیارییەکم فێربکە بمگەیەنێنێتە ئاوات و مەبەستی خۆم.

٤- نابێ پەلە لەئیش وکاری رۆژانەدا بکرێت، چونکە گەلێ لەوکارانە هەیە کاتی گونجاوو شیاویان دەوێ.

٥- زۆربەی رووداوەکان دوو دیمەنیان هەیە، دیمەنێکی ئاشکرا لە ئێمە، دیمەنێکی دیکەی نادیار، جا هەر شتێك لەژیانماندا رووبدا، نابێ بەپەلە بریار بدەین، چونکە گەلێ لەو کارانە کە روودەدەن وحیکمەتەکەیان لە ئێمەوە نادیارە، بۆدوایی دەردەکەوێ کەحیکمەتێکی وردیی خوایی لەبندایە.

٦- دین و ئیمانی باوك کەڵك دەبەخشێ بەرۆڵەی بروادرایان، چونکە (خضر) لەبەر باوکێکی صالح وچاککاربوو بەرگری لەگەنجینەی منداڵەکان کرد.

٧- زۆر جارمرۆڤ دەبێتە ناحەزونەیاری هەرشتێك نەیزانێ، دەشێ کەسێك ئامۆژگاری کەسێتر بکاو لێیشی وەرنەگرێ و، گلەییش لەبابای ئامۆژگاربکا!.

٨- دەبێ قوتابی وشاگرد بەرامبەر بەماموستاکەیان ، زۆر بەئەدەب ولەسەر خۆبن و لە ئاست یەکتردا زۆریش خۆ بەکەم زانبن.

الجزء السادس عشر — سورة الكهف

إِنَّا مَكَّنَّا لَهُۥ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَءَاتَيۡنَٰهُ مِن كُلِّ شَيۡءٖ سَبَبٗا ﴿٨٤﴾ فَأَتۡبَعَ سَبَبًا
﴿٨٥﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَغۡرِبَ ٱلشَّمۡسِ وَجَدَهَا تَغۡرُبُ فِي عَيۡنٍ حَمِئَةٖ
وَوَجَدَ عِندَهَا قَوۡمٗاۖ قُلۡنَا يَٰذَا ٱلۡقَرۡنَيۡنِ إِمَّآ أَن تُعَذِّبَ وَإِمَّآ أَن تَتَّخِذَ
فِيهِمۡ حُسۡنٗا ﴿٨٦﴾ قَالَ أَمَّا مَن ظَلَمَ فَسَوۡفَ نُعَذِّبُهُۥ ثُمَّ يُرَدُّ إِلَىٰ رَبِّهِۦ
فَيُعَذِّبُهُۥ عَذَابٗا نُّكۡرٗا ﴿٨٧﴾ وَأَمَّا مَنۡ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَلَهُۥ جَزَآءً
ٱلۡحُسۡنَىٰۖ وَسَنَقُولُ لَهُۥ مِنۡ أَمۡرِنَا يُسۡرٗا ﴿٨٨﴾ ثُمَّ أَتۡبَعَ سَبَبًا ﴿٨٩﴾ حَتَّىٰٓ
إِذَا بَلَغَ مَطۡلِعَ ٱلشَّمۡسِ وَجَدَهَا تَطۡلُعُ عَلَىٰ قَوۡمٖ لَّمۡ نَجۡعَل لَّهُم مِّن
دُونِهَا سِتۡرٗا ﴿٩٠﴾ كَذَٰلِكَۖ وَقَدۡ أَحَطۡنَا بِمَا لَدَيۡهِ خُبۡرٗا ﴿٩١﴾ ثُمَّ أَتۡبَعَ
سَبَبًا ﴿٩٢﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ بَيۡنَ ٱلسَّدَّيۡنِ وَجَدَ مِن دُونِهِمَا قَوۡمٗا
لَّا يَكَادُونَ يَفۡقَهُونَ قَوۡلٗا ﴿٩٣﴾ قَالُواْ يَٰذَا ٱلۡقَرۡنَيۡنِ إِنَّ يَأۡجُوجَ وَمَأۡجُوجَ
مُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَهَلۡ نَجۡعَلُ لَكَ خَرۡجًا عَلَىٰٓ أَن تَجۡعَلَ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَهُمۡ
سَدّٗا ﴿٩٤﴾ قَالَ مَا مَكَّنِّي فِيهِ رَبِّي خَيۡرٞ فَأَعِينُونِي بِقُوَّةٍ أَجۡعَلۡ بَيۡنَكُمۡ
وَبَيۡنَهُمۡ رَدۡمًا ﴿٩٥﴾ ءَاتُونِي زُبَرَ ٱلۡحَدِيدِۖ حَتَّىٰٓ إِذَا سَاوَىٰ بَيۡنَ ٱلصَّدَفَيۡنِ
قَالَ ٱنفُخُواْۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَعَلَهُۥ نَارٗا قَالَ ءَاتُونِيٓ أُفۡرِغۡ عَلَيۡهِ قِطۡرٗا
﴿٩٦﴾ فَمَا ٱسۡطَٰعُوٓاْ أَن يَظۡهَرُوهُ وَمَا ٱسۡتَطَٰعُواْ لَهُۥ نَقۡبٗا ﴿٩٧﴾

٣٠٣

**سەرگروشتەی زیلقەرنەین:**

﴿[٨٣] **ویسألونك عن ذی القرنین**﴾ لەبارەی (زولقەرنەین) یشەوە پرسیارت لێدەکەن؟ ﴿**قل سأتلوا علیکم منه ذکرا**﴾ پێیان بڵێ: ئەی موحەممەد ﷺ واهەندێ لەبەسەرهاتی ئەویشتان بۆباس ئەکەم ﴿[٨٤] **إنا مکنا له فی الأرض**﴾ بەراستی ئێمە هێزو دەسەڵاتمان لە زەوییدا پێدا ﴿**وآتیناه من کل شئ سببا**﴾ وەلە هەموو شتێك کە پێویست بوو هۆکارو ئامرازەکەیمان بۆ رەخساند ﴿[٨٥] **فأتبع سببا**﴾ ئەوسا ئەویش هۆیەکانی بەکار هێناو بەدوای مەبەستییدا چوو تاگەیشتە مەبەستی خۆی.

راڤەکەرانی قورئان ئەڵێن: ئەم (زولقەرنەین)ـە هەر ئەسکەندەری یۆنانییە، توانیویەتی خۆرهەڵات وخۆرئاوا بخاتە ژێردەسەڵاتی خۆیەوە، هەربۆیە ناویشیان ناوە (ذو القرنین)، چونکە پاشایەکی بڕوادارو چاك ودادگەر بووە، وە لەنێوان سەردەمی عیساو موحەممەددا سەلامی خوایان لەسەر بێت ژیاوە. هەرچەندە لەدیاریکردنی ئەم (زولقەرنەین)ەدا لەناو مێژوو نووساندا کێشە هەیە: بۆ نمونە هەندێکیان ئەڵێن: ئەسکەندەری مەقدۆنیی یۆنانییەو بەئەسکەندەری رۆمیش بەناوبانگەو، شاگردی (ئەرەستۆی حەکیم) بووە، (٣٠٠)ساڵیش پێش لەدایکبوونی عیسادا بووە، لەخۆرئاواوە ولاتی (ئیتالیای) ئەمڕۆو (فەرەنسەو ئیسپانیای) داگیر کردووە، لەولایشەوە ئەوبەری دەریای سپیی باکوری ئەفەریقیای داگیرکردو شاری ئەسکەندەریەی دروستکرد، لەم لایشەوە هیندستان وچین وئەوانەی داگیرکرد.. جا لەگەڕانەوەیدا لە (خورماڵ)ی سەر بەهەڵەبجەی سولەیمانیی نەخۆش دەکەوێت و ئەمرێت، هەندێ زانای مێژووناسیش ئەڵێن: تەرمەکەیان هێناوەتەوە بۆشارۆچکەی ئەسکەندەرییەی لای شاری بەغداو، لەوێ بەخاك سپێرراوە. ئەم زانیارییەم لەتەفسیری نامیی بەدەسکارییەوە وەرگرتووە.

**زیلقەرنەین چوو هەتا گەیشتە خۆرنشین:**

﴿[٨٦] حتى إذا بلغ مغرب الشمس﴾ خۆی ولەشکرەکەی کەوتە ڕێ تا گەیشتە ناوچەکانی خۆرئاوا ﴿وجدها تغرب فى عين حمئة﴾ وا هاتە بەرچاوی خۆر لە گۆم وکانیاوێکی رەش ولێڵدا ئاوا ئەبێت ﴿ووجد عندها قوما﴾ هەرلەوێیشدا گەلێکی دڵڕەق وبت پەرستو خوانەناسی دی ﴿قلنا ياذا القرنين﴾ وتمان: ئەی زولقەڕنەین! ﴿إما ان تعذب﴾ دەتوانی سزایان بدەی، ئەگەر بەردەوامبن لەسەر کوفری خۆیان ﴿وإما أن تتخذ فيهم حسنا﴾ دەشتوانی ڕێگایەکی چاکیان بۆهەڵبژێرریت، بانگیان کەیت بۆلای ئایینی خواو چاکەیان لەگەڵ بکەیت ﴿[٨٧] قال أما من ظلم﴾ وتی: بەڵێ وا ئەکەم، بەلام هەرکەسێ ستەم وهاوبەشێ بۆخوا دابنێ و لەسەر بێبڕوایی خۆیشی بمێنێتەوە ﴿فسوف نعذبه﴾ ئێمەش لەدواییدا سزای ئەدەین وئەیکوژین ﴿ثم يرد إلى ربه﴾ پاشانیش دەبرێتەوە لای پەروەرد گاری ﴿فيعذبه عذابا نكرا﴾ ئەوسا ئەویش سزایەکی زۆر سەخت وگەورەی دەدا لەدۆزەخدا ﴿[٨٨] وأمامن آمن وعمل صالحا﴾ هەرکەسەش بڕوای هێناو لەکوفر دوورکەوتەوە وکاری پەسەندوچاکی کرد ﴿فله جزاءً الحسنى﴾ پاداشتی زۆرباشی بۆئەبێ ﴿وسنقول له من امرنا يسرا﴾ و کاروباری ئەم دونیایەشی بۆئاسان دەکەین.

**زولقەرنەین گەیشتە خۆرهەلات:**

﴿[٨٩] ثم اتبع سببا﴾ پاش ئەوەکە ولاتی خۆرئاوای گرت دیسانیش سوودی لەوهۆیانە وەرگرت لەبەردەستیا بوون و، ڕێگەی گرتە بەر بۆ خۆرهەلاتیش ﴿[٩٠] حتى إذا بلغ مطلع الشمس﴾ تا گەیشتە ناوچەکانی خۆرهەڵات، ﴿وجدها تطلع على قوم لم نجعل لهم من دونها سترا﴾ دیتی خۆر لە پێش چاویدا بەسەر هۆزێکا هەڵدێت کە هیچ پەناگاو داپۆشەرێکمان لەونەداونەتێ، واتە: هیچ جل وبەرگ وفەرش ورایەخێکیان نەبوو، وەلە دەشتێکی کاکی بەکاکییدا دەژیان و، نەدارو نەدرەخت و، نەشاخ وکێوی تێدانەبوو، تەنانەت بەکەڵکی بیناو ساختمانیش نەدەهات ﴿[٩١] كذلك وقد أحطنا بما لديه خبرا﴾ ئەوسا رەفتارو هەڵسوکەوتی (ذوالقرنين) لەگەڵ گەلی خۆرهەلاتیشدا هەروەکو رەفتارو هەڵسووکەوتی وابوو لەگەڵ گەلی خۆرنشیندا، وە بێگومان ئێمە بەتەواویی ئەمانزانی بەوەی ئەوبیری بۆی دەچوو، دەمانزانی سوپاو لەشکرو راوێژکارو دارایی بۆ ئەو جەنگە چەندە.

## زولقەرنەین گەیشتە دەڤەری لای ئاجووج و ماجووج:

﴿٩٢ ثم اتبع سببا﴾ دیسانەوە پاش رامکردنی ولاتی خۆرهەلات رێگەیەکی ترو هۆیەکی تری گرتەبەر بەرەو
باکوور ﴿٩٣ حتی إذا بلغ بین السدین﴾ تا گەیشتە نێوان دووکێوی گەورە کەلە باکوری ولاتی چیندان و بۆتە
جیاکەرەوەی ولاتی (چین لەمەنغۆلیا)وە لە دەوروبەری (ئەرمینیا)و (ئازەربایجان)دا، ﴿وجد من دونهما قوما﴾
لەخوارووی دوو کێوەکەدا خەلکانێکی دیبت بێجگە لەدوودەستەکەی تر ﴿لا یکادون یفقهون قولا﴾ لەوانە بوو
لەهیچ قسەیەك تێنەگەن، واتە: خەلکێکی زماننەزان وکەودەن ودوور لەشارستانییەت بوون، چونکە لەناوچەیەکی
شاخاویی ودوورلەئاوەدانییدا بوون، وە ئەوخەلکە بەدەست دوژمنێکی سەر سەخت بەناوی یاجوج وماجوجەوە
گیرۆدە ببوون، بۆیە کاتێ دەسەلاتەکەی زولقەرنەین یان دیبت، خێرا پەنایان پێبرد ﴿٩٤ قالوا یا ذا القرنین﴾ وتیان:
ئەی زولقەرنەین! ﴿إن یأجوج ومأجوج مفسدون فی الأرض﴾ بەراستی یاجوج وماجووج لەم ولاتەدا بەدفەڕوو
خراپەکارن. بەلێ.. ئەمانە لەنەژاددا هەرئادەمزادن، بەلام سیمایان تێکەو لێکەیە، هی وایان هەیە کورتەبالایە،
هەیانە بالابەرزە، گەلێکی تالانکەرو دزوو پیاوکوژن، هەرچییان بەرپەلکەوێ ئەیخۆن: (عن زینب بنت جحش –رضی
الله عنها– قالت: ((استیقظ النبی ﷺ من نومه وهو محمر وجهه، وهو یقول لا إله إلا الله، ویل للعرب من شر قد
اقترب! فتح الیوم من ردم یأجوج ومأجوج مثل هذا وحلق قلت: یا رسول الله ﷺ: انهلك وفینا الصالحون؟ قال نعم إذا
کثر الخبث)) خاتوونە زەینەب خوا لێیرازی بێت دەلێت: پێغەمبەر ﷺ لەخەو بەخەبەر هات، کەرەنگو روخساریی
سوورهەلگەڕابوو! دەیگوت: هاوارو واوەیلا بۆ(عەرەب!) لەوشەرو خراپیو بەد فەرییەی لێیانەوە نزیك بۆتەوە،
وائەمرۆ دەرگای بەربەستەکە لە(یاحوج وماجووج) دەکرێتەوە، وەك ئەم دوو پەنجەیە (پەنجە گەورەو، پەنجەی
شایەتومان)، واتە: وەکو ژمارە(٩٠) کەلەلای عەرەب باوبووە بەوجۆرەیە یەکتریان لەژمارە ئاگادارکردووە. خاتوو
زەینەب گوتی: ئاخۆ ئێمەش تیابچین کەخەلکانی صالحو باشمان لەنێواندا بێت؟! فەرمووی بەلێ هەرکات زیناو
فەسادوو خراپەکاریی زۆربوو. پێشەوائەحمەد. ﴿فهل نجعل لك خرجا﴾ ئاخۆ ئەگونجێ ئێمە باج وخەرجیی
ودیارییەکت بۆ کۆبکەینەوە ﴿علی أن تجعل بیننا وبینهم سدا﴾ کە لەنێوان ئێمەوئەواندا بەربەستێك دروست
بکەیت، تائەوان نەتوانن شالاومان بۆبێنن ﴿٩٥ قال ما مکنی فیه ربی خیر﴾ زولقەرنەین وتی: ئەو زانیاریی ومالُ
وسامان ودارایی ودەسەلاتەی کەپەروەردگارم پێیداوم چاکترە لەوەی ئێوە ئەمدەنێ ﴿فأعینونی بقوة﴾ سامان
پێویست نییە، بەلکو ئێوە بەهێزی بازووی خۆتان یارمەتیم بدەن ﴿أجعل بینکم وبینهم ردما﴾ ئەوسا لەنێوان
ئێوەوئەواندا بەربەستێکی ئەستوور دروست دەکەم ﴿٩٦ اتونی زبر الحدید﴾ دەسالەتە ئاسنی گەورەم بۆ بێنن و
کەلەکەی بکەن ﴿حتی إذا ساوی بین الصدفین﴾ ئەوانیش ئاسنیان لەسەریەك کەلەکە کرد تا دیوارێکی دروستکردو
ئەم بەروئەوبەری کێوەکەی پڕکرد ﴿قال انفخوا﴾ ئەوجا وتی: بەدەوریدا ئاگر هەلکەن وخۆشیکەن وبیدەمێنن
﴿حتی إذا جعله نارا﴾ ئەوانیش کارەکەیان ئەنجامدا تا پارچەئاسنەکان هەموو بوونە ئاگرو سووربوونەوە ﴿قال
آتونی افرغ علیه قطرا﴾ ئینجا وتی: ئێستا مسی قالُ و تواوەم بۆبێنن با سەریا بیرێژم، ئەوانیش داواکەیان
جێبەجێکردو، ئەمیش ئاسنەکەی گوشیی و بوو بەیەك پارچەو سەدێکی قایمی دروستکرد ﴿٩٧ فما اسطاعوا أن
یظهروه﴾ ئیتر گێرەشێوینە (مفسد)ەکان نەیانتوانی سەرکەونە سەری لەبەر ئەستووریی و بەرزیی ﴿وما استطاعوا
له نقبا﴾ نەشیانتوانی لەخوارەوە کونیکەن لەبەرقایمی و مەحکەمی ﴿٩٨ قال هذا رحمة من ربی﴾ ئینجا زولقەرنەین
وتی: ئەم دەسەلات و بەربەستە رەحمەت ومیهرەبانییەك بوو لەلایەن پەروەردگارمەوە پێی بەخشیوم، ئەگینا

ئەوکارە لەتوانای مندا نیە ﴿فإذا جاء وعد ربی جعله دكا﴾ ئینجا هەرکاتێ بەڵێنی بەرەڵڵابوونیان لەلایەن پەروەردگارمەوە بەجێ گەیشت کەکاتی نزیکبوونەوەی ڕۆژی قیامەتە ئەو بەربەستە وێران ئەکات وئەیکوتێ بەسەریەکاو وردوخاشی دەکا ﴿وكان وعد ربی حقا﴾ خۆ بێگومانیشە بەڵێنی پەروەردگاری من ڕاست ودروستە و، هەر وەدی دێ.

لەم داستانە مێژووییەدا:

١- هیچ کارێك بێ پەیداکردنی هۆو ئەسبابی شیاوی خۆی ئەنجام بەخش نابێ، وەك زولقەرنەین پێی هەڵسا: (ثم اتبع سببا)... سێ جار قورئان دووپاتی دەکاتەوە.

٢- هیچ دەوڵەت ودەسەڵاتدارێك سەرکەوتوو نابێت تاچاکان وخزمەتگوزاران دڵخۆش نەکات و" لاسارو خراپکارانیش سزا نەدات، واتە: نابێ بەیەك چاوسەیری هەردوولا بکات.

٣- داوای گران و قورس لەمیللەت شیاوی دەوڵەتی ئیسلامیی نییە.

٤- نابێ هیچ دەوڵەتێکی دڵسۆز لەداواکارییەکانی گەل بێ وەڵام بێت.

٥- زولقەرنەین تەنانەتی لەگەڵ ئەوانەدا کە لەقسە تێ نەئەگەیشتن خەریك بوو و داخوازییەکانی وەڵام دانەوەو بەربەستەکەی بۆ دروستکردن لەگەڵ ئەوهەموو ئەزیەتەدا.

٦- دروستکردنی ئەمنییەت وپاراستنی وڵات، یەکەم مەرجە بۆ ژیانی ئاسوودەیی، بۆیە زولقەرنەین ئەوهەموو هەوڵەی دا بۆبەندکردنی یاجوج وماجوج تا هێرش نەهێننە سەر ئەوگەلە.

٧- هەرەوەزیی وهاریکاری لەئەنجامدانی کارە گشتییەکاندا لەناو جەماوەردا خاڵێکی زۆر گرنگە بۆ پیرۆزی بە دەستهێنان وپاشان بەرگری لێکردنی.

الجزء السادس عشر　　سورة الكهف

قَالَ هَٰذَا رَحۡمَةٞ مِّن رَّبِّيۖ فَإِذَا جَآءَ وَعۡدُ رَبِّي جَعَلَهُۥ دَكَّآءَۖ وَكَانَ وَعۡدُ رَبِّي
حَقّٗا ٩٨ ۞وَتَرَكۡنَا بَعۡضَهُمۡ يَوۡمَئِذٖ يَمُوجُ فِي بَعۡضٖۖ وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ
فَجَمَعۡنَٰهُمۡ جَمۡعٗا ٩٩ وَعَرَضۡنَا جَهَنَّمَ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡكَٰفِرِينَ عَرۡضًا ١٠٠
ٱلَّذِينَ كَانَتۡ أَعۡيُنُهُمۡ فِي غِطَآءٍ عَن ذِكۡرِي وَكَانُواْ لَا يَسۡتَطِيعُونَ
سَمۡعًا ١٠١ أَفَحَسِبَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَن يَتَّخِذُواْ عِبَادِي مِن دُونِيٓ
أَوۡلِيَآءَۚ إِنَّآ أَعۡتَدۡنَا جَهَنَّمَ لِلۡكَٰفِرِينَ نُزُلٗا ١٠٢ قُلۡ هَلۡ نُنَبِّئُكُم بِٱلۡأَخۡسَرِينَ
أَعۡمَٰلًا ١٠٣ ٱلَّذِينَ ضَلَّ سَعۡيُهُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَهُمۡ يَحۡسَبُونَ أَنَّهُمۡ
يُحۡسِنُونَ صُنۡعًا ١٠٤ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ وَلِقَآئِهِۦ
فَحَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡ فَلَا نُقِيمُ لَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَزۡنٗا ١٠٥ ذَٰلِكَ جَزَآؤُهُمۡ
جَهَنَّمُ بِمَا كَفَرُواْ وَٱتَّخَذُوٓاْ ءَايَٰتِي وَرُسُلِي هُزُوًا ١٠٦ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ
وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَانَتۡ لَهُمۡ جَنَّٰتُ ٱلۡفِرۡدَوۡسِ نُزُلًا ١٠٧ خَٰلِدِينَ
فِيهَا لَا يَبۡغُونَ عَنۡهَا حِوَلٗا ١٠٨ قُل لَّوۡ كَانَ ٱلۡبَحۡرُ مِدَادٗا لِّكَلِمَٰتِ رَبِّي
لَنَفِدَ ٱلۡبَحۡرُ قَبۡلَ أَن تَنفَدَ كَلِمَٰتُ رَبِّي وَلَوۡ جِئۡنَا بِمِثۡلِهِۦ مَدَدٗا ١٠٩ قُلۡ
إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٞ مِّثۡلُكُمۡ يُوحَىٰٓ إِلَيَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۖ فَمَن كَانَ يَرۡجُواْ
لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلۡيَعۡمَلۡ عَمَلٗا صَٰلِحٗا وَلَا يُشۡرِكۡ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدَۢا ١١٠

سورة مريم　٣٠٤

٨- ڕابەری ڕاستەقینە دەبێ ئەوەندە سامان وماددەی لا گرنگ نەبێ، هەروەکو پەیامبەرانیش ئەو ڕەوشەیان هەبوو:(لا أسألكم عليه من أجر).

٩- مرۆڤ هەرچەندە دەسەڵات وهێزی زۆر لەبەردەستیا بێت نابێ لەخۆبایی ویاخیی ببێ.

١٠- هەمووشتێك تەواو دەبێ ودەڕوات، ئەگەرچی زۆریش قایم ومەحکەم بێت، کەوابوو لەپێکەوە نانی سامان ودارایی و دەسەڵاتدا دەبێ هۆشیار بین.

﴿[٩٩] وتركنا بعضهم يومئذ يموج فی بعض﴾ وەلەو ڕۆژە بەدواوە وازمان لێهێنان تاوەکو شەپۆل ئەدەن وبەیەکدا دێن وەك شەپۆلی دەریا، یاخود وازمان لێهێناون بۆئەو ڕۆژەی کەبەربەستەکە دەشکێت، ئەوانیش بەپەلەو بە کۆمەڵ

دێنـەدەرێ، کەئـەوەیش یەکێکـە لەنیشـانەکانی ڕۆژی قیامـەت. ﴿ونفـخ في الصـور فجمعنـاهم جمعـا﴾ لـەوەو دوا لەنەفخەی دووەمدا فوو بەشەیپووردا ئەکرێ وهەموو کۆئەکەینەوە بۆحیساب و کیتاب.

دۆزەخ لەبەردەم خوانەناساندا رادەنرێ:

﴿١٠٠ وعرضنا جهنم يومئذ للكافرين عرضا﴾وە لەورۆژەدا دۆزەخ بەشێوەیەکی زۆر قورس وناڕەحەت بۆکافرو بێبڕوایان دەخەینە ڕوو وهەمووشیانی تێ دەخەین ﴿١٠١ الذين كانت اعينهم فى غطاء عن ذكرى﴾ ئەوانەی چاویان لەناوپەردەی لێڵی وتاریکییدا قووچاوبوو لەیادی قورئانەکەم و,نەیاندەویست یادی بکەن ﴿وكانوا لا يستطيعون سمعا﴾ نەشیاندەتوانی ببیسن وخۆیان کردبووە کەڕولاڵ و حەزیان لە قورئان نەدەکرد ﴿افحسب الذين كفروا ان يتخذوا عبادى من دونى أولياء﴾ ئاخۆ کافرو بێباوەڕان لایان وایە وبۆیان دەچێتەسەر ئەگەر- لەباتی من- هەندێ لە بەندەکانم بکەنە پشتیوان ودۆستی خۆیان وکەڵکیان پێدەگەیەنن ولەسزای من ڕزگاریان دەکەن؟! ﴿إنا اعتدنا جهنم للكافرين نزلا﴾ با ئەوانە چاك بزانن کە بێگومان ئێمە دۆزەخمان کردۆتە پەزیرایی و مەنزڵگەی بێبڕوایان ولەوێ نیشتەجێ دەبن.

کێ زۆرتر زیانی پێدەگا لە کردەوەکانیدا:

﴿١٠٣ قل هل ننبئكم بالأخسرين أعمالا﴾ بڵێ ئەی محەممەد ﷺ!: ئایا پێتان بڵێم: زیانبارترین کەس لای خوا کێیە؟ ﴿١٠٤ الذين ضل سعيهم فى الحياة الدنيا﴾ ئەوانەن کەهەوڵ وتێکۆشانەکانیان لەم ژیانی دونیادا بەهەوانتەو بێ ناوەرۆك دەرچوو، چونکە بێبڕوابوون وهەرچیشیان کردبێ لێیان وەرنەگیراوە. (تەبەریی) دەڵێت: ئەم هەڕەشەیە تەواوی خەڵکانیبیدعەچی و, خاوەن بیروباوەڕە گەندەڵ و چەواشە کاریەکان دەگرێتەوە. ﴿وهم يحسبون انهم يحسنون صنعا﴾ لەگەڵ ئەوەیشدا لایان وایە کارێکی شیاوو شایستەیان ئەنجام داوە، خۆیان نەزانکرد کە: ئاکارچاکی لەگەڵ کوفروبێبڕواییدا کەڵکی نابێ ﴿١٠٥ أولئك الذين كفروا بآيات ربهم ولقائه﴾ ئەوانە کەسانێکن کەبەئایەتەکانی پەروەردگاریان وبەگەیشتنی دیداری ئەو لەدواڕۆژدا کافرو بێباوەڕبوون ﴿فحبطت اعمالهم﴾ ئینجا لەبەرئەوە کردەوەکانیان نابوودو پووچەڵبووە﴿فلا نقيم لهم يوم القيامة وزنا﴾ ئینجا ئێمەش لەڕۆژی قیامەتدا هیچ تەرازوو میزانێکی سەنگینیان بۆدانانێین. (واتە:هیچ نرخ و بایەخیەکیان نابێ). (عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ: ((إنه ليأتي الرجل العظيم السمين يوم القيامة، لا يزن عند الله جناح بعوضة، وقال: اقرؤا إن شئتم: ((فلا نقيم لهم يوم القيامة وزنا)). متفق عليه!!

﴿١٠٦ ذلك جزاؤهم جهنم﴾ ئەوەتۆڵەیان بێ ئاگری‌دۆزەخ ﴿بما كفروا واتخذوا آياتى ورسلى هزوا﴾ لەبەر بێبڕوایی وگاڵتەکردنیان بەئایەت وبەپەیامبەرانی من.

پاداشتی موسڵمانە صالحەکان:

﴿١٠٧ إن الذين آمنوا وعملوا الصالحات﴾ بێگومان ئەوانەی ئیمان وباوەڕیان هێناو, کردوەی چاکیان ئەنجام دا ﴿كانت لهم جنات الفردوس نزلا﴾ هەر لەزووەوە باخەکانی فیردەوسمان کردۆتە جێی پەزیراییان. (عن عبادة بن الصامت رضي الله عنه أن رسول الله ﷺ قال: ((الجنة مأة درجة، ما بين كل درجتين كما بين السماء والأرض، أعلاها الفردوس، ومنها تفجر أنهار الجنة الأربعة، فإذا سألتم الله فاسألوا الفردوس)). ونحوه عن أبي هريرة ومعاذ بن جبل وغيرهم من الصحابة). متفق عليه. بەهەشت سەدپلەیە، دووری هەر یەکێکیان لەیەکدی بەقەد دووری ئاسمان و زەمینە لەیەکتر،

مەزن و بڵندتریان باخاتی (فیردەوس)ـە، هەرچوار جۆبارە کانی بەهەشتیش هەرلەوێ هەڵدەقوڵێن، ئەوسا هەرکات ئێوە داواتان لەخوا کرد، فیردەوسی لێبخوازن.

﴿١٠٨ خالدين فيها﴾ بەهەتا هەتاییش لەوێدا ئەمێننەوەو ژیانیان تێیدا نەبڕاوەیە ﴿لا يبغون عنها حولا﴾ هەرگیز بێزارنابن و بۆ خۆشیان داوای جێ گۆڕکێ ناکەن و، قەتیش پێیان خۆش نییە لێیدەرچن.

**وشەکانی خوا تەواو نابن، ئەر دەریاکانیش ببنە مەرەکەف:**

﴿١٠٩ قل لو كان البحر مدادا لكلمات ربي﴾ پێیان بڵێ: ئەگەر بۆ نووسینی وشەکانی پەروەردگارم دەریا گشت مەرەکەف بێ تاحیکمەت ونهێنیەکانی ئەویان پێبنووسرێ ﴿لنفد البحر قبل أن تنفد كلمات ربي﴾ پێش لەکۆتایی هێنانی وتەو بڕیارەکانی پەروەردگارم دەریا هەموو هەڵدەچۆڕێ ﴿ولو جئنا بمثله مددا﴾ ئەگەرچی ئەوەندەی تریشیان فریاخەین بۆکۆمەکیان، هێشتا هەرکۆتاییان نایەت.

**موحەممەد ئادەمزادەو، خواش هەریەکە:**

﴿١١٠ قل إنما أنا بشر مثلكم يوحى إلي﴾ پێیان بڵێ ئەی پێغەمبەر!ﷺ منیش تەنها هەرمرۆڤێکم وەك ئێوە، وەحیم بۆ دەکردێ کە: ﴿أنما إلهكم إله واحد﴾ بڵێم بەڕاستی تەنیا یەکخواو پەرستراوەیە، تەنها خواو پەرستراوێکی یەکتایە ﴿فمن كان يرجوا لقاء ربه﴾ ئینجا هەرکەسێك لەئێوە ئومێدی بەگەیشتنی دیداری پەروەردگاری خۆی هەبێ لەدواڕۆژدا ﴿فليعمل عملا صالحا﴾ با کاری چاك وکردەوەی دروست ئەنجام بدات ﴿ولا يشرك بعبادة ربه أحدا﴾ وە لەپەرستنی پەروەردگاری خۆیدا هیچ کەسێك نەکاتە هاوتاو هاوبەشیی و رووپامایی نەکات، چونکە خوا تەنها دڵسۆزیی وئیخلاس وەرئەگرێ، نەڕییاو رووپامایی وشیرك و هاوبەش دانان.

(ولله الحمد والمنة).

*** *** ***

## ١٩- سوورەی (مەریەم)ـە

## مەککەییەو (٩٨) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتەش هەربۆ چەسپاندنی یەکتاپەرستیی وزیندووبوونەوەو پاداشت وتۆڵەیە، دەشتوانین کورتتر بڵێین کە: هەموو تەوەرەکەی تەوحیدو بڕوا بوونە بەبوون وتاك وتەنیایی خوای گەورە.. پەیڕەوو پرۆگرامی ڕێگاو ڕێبازی ڕاستان و گومڕایان.

* داستانی هەندێ لە پەیامبەران وەکو (زەکەریا)و (یەحیا)ی کوڕیی و(مووسا..)/ علیهم الصلاة و السلام) دێنێ وهەرلەوێشەوە دەست پێدەکات.

* ڕووداوە مێژووییەکەی خاتوو(مەریەم) و عیسای‌کوڕی دەگێڕێتەوە، چونکە ویستی خوا وابوو کەئەو موجیزە گەورەیە ڕووبدات بە لە دایکبوونی عیسا ﷺ بێ هیچ جۆرە پەیوەندییەکی نێرو مێیی! بێ ئەوەی مەریەم مێرد بکات، بۆیە پێی‌دەڵێن: (مريم العذراء).

* لەپاشان باسی (ئیبراهیم) لەگەڵ باوکیدا دێت، ئینجا نرخاندن وڕێزدانان بۆ ئەم پەیامبەرە بەڕێزانە: (ئیسحاق، یەعقوب، مووسا، هاروون، ئیسماعیل، ئیدرس، نووح) -سەلامی خوایان لەسەربێت- دەشتوانین بڵێین: دوولەسەرسێی سوورەتەکە باسی ئەمانەیە، ئەڵبەتە مەبەستیش لەوە ڕاگەیاندنی ئەوڕاستییەیە کە هەموو

پەیامبەران هەر یەك كاری سەرەكییان بووە، ئەویش یەكتاپەرستیی و دووركەوتنەوەیە لەهەر هاوبەش و بڕیاردانێك، بەدەر لە شەریعەتەكەی خوا.

* چەند دیمەنێكی ڕۆژی قیامەت دێنێت، كە چۆن تاوانبارە بێ باوەڕەكان بەدەوری جەهەننەمدا لەسەر ئەژنۆ كەوتوون و چاوەڕوانن فڕێ بدرێنە ناویەوە.

* كۆتاییشی دێت بەدوور ڕاگرتنی خوای گەورە لە هەرجۆرە هاوبەشێك: منداڵ.. هتد. وە بەتوندترین شێوە بەگژ هاوبەشدانەراندا دەڕواو بەهێزترین بەڵگەیان بۆدێنێتەوە، لەسەر بێ شەریكی خوا.

* ناویشی سوورەی (مەریەم)ـە، لەبەرئەوە تا دنیادنیا بێت ئەوداستانە سەر سوڕهێنەرە هەرشكۆمەندبێت وبوترێتەوە، منداڵێك لەدایكبوو بەبێ باوك!! پاشان بۆ پاكانەی دایكەكەی لەلانك وبێشكەدا بێتە گفتوگۆو قسەوباس كەئەمیش دیسانەوە ڕووداوێكی سەیرترە مرۆڤەكان گشت واقیان وڕدەمێنێ لەبەرامبەریەوە، ئەگەر خۆ نەدەن بەدەستەوە.

دەسا سڵاو لە مەریم وكوڕەكەی (واتە: عیسا) ﷺ تا ڕۆژی دوایی دێ، دەباهەر بەرزو شكۆمەند بێت پلەی ژنانی داوێنپاك وسەربڵند وەك بەرزیی وبڵندیی كێوەكانی كوردستان.

الجزء السادس عشر سُورَةُ مَرۡيَمَ

سُورَةُ مَرۡيَمَ (مكية ١٩ – آياتها ٩٨)

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
كٓهيعٓصٓ ١ ذِكۡرُ رَحۡمَتِ رَبِّكَ عَبۡدَهُۥ زَكَرِيَّآ ٢
إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥ نِدَآءً خَفِيّٗا ٣ قَالَ رَبِّ إِنِّي وَهَنَ ٱلۡعَظۡمُ
مِنِّي وَٱشۡتَعَلَ ٱلرَّأۡسُ شَيۡبٗا وَلَمۡ أَكُنۢ بِدُعَآئِكَ رَبِّ
شَقِيّٗا ٤ وَإِنِّي خِفۡتُ ٱلۡمَوَٰلِيَ مِن وَرَآءِي وَكَانَتِ
ٱمۡرَأَتِي عَاقِرٗا فَهَبۡ لِي مِن لَّدُنكَ وَلِيّٗا ٥ يَرِثُنِي وَيَرِثُ
مِنۡ ءَالِ يَعۡقُوبَۖ وَٱجۡعَلۡهُ رَبِّ رَضِيّٗا ٦ يَٰزَكَرِيَّآ
إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَٰمٍ ٱسۡمُهُۥ يَحۡيَىٰ لَمۡ نَجۡعَل لَّهُۥ مِن قَبۡلُ سَمِيّٗا
٧ قَالَ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَٰمٞ وَكَانَتِ ٱمۡرَأَتِي
عَاقِرٗا وَقَدۡ بَلَغۡتُ مِنَ ٱلۡكِبَرِ عِتِيّٗا ٨ قَالَ كَذَٰلِكَ
قَالَ رَبُّكَ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٞ وَقَدۡ خَلَقۡتُكَ مِن قَبۡلُ وَلَمۡ تَكُ
شَيۡـٔٗا ٩ قَالَ رَبِّ ٱجۡعَل لِّيٓ ءَايَةٗۖ قَالَ ءَايَتُكَ أَلَّا
تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ ثَلَٰثَ لَيَالٖ سَوِيّٗا ١٠ فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوۡمِهِۦ
مِنَ ٱلۡمِحۡرَابِ فَأَوۡحَىٰٓ إِلَيۡهِمۡ أَن سَبِّحُواْ بُكۡرَةٗ وَعَشِيّٗا ١١

٣٠٥

بەم شێوەیە دەست پێدەكات: ﴿بسم الله الرحمن الرحيم * [1] كهيعص﴾ ئەم پێنج پیتە: (كاف، ها، یا، عەین، صاد) هێمای ئیعجازی قورئانن، هەروەك لەچەند جێیەكدا باسكرا.

**زەكەریا هانا دەباتە بەر پەروەرێنی:**

﴿[2] ذكر رحمة ربك عبده زكريا﴾ ئەم باسە یادی رەحمەت ومیهرەبانیی پەروەردگاری تۆیە ئەی موحەممەد! دەربارەی (زەكەریا) بەندەی خۆی ﴿[3] إذ نادى ربه نداء خفيا﴾ ئەودەمەكە زۆر بەهێواش ولەسەرخۆو زۆر بە وێڵ و بەئەدەبەوە لەمیحرابەكەی خۆیدا هاناوهاواری لەپەروەردگاری خۆیكرد بەدەنگێكی نەرم ونەوی، تاخزم وكەس وكاری نەزانێ و، پێش هەمووشتێكیش خوا حەزی لەئارامیی و لەسەرخۆیە ﴿[4] قال رب إني وهن العظم مني﴾ گوتی: ئەیپەروەردگارم! بەڕاستیی خۆت چاك دەزانی كە من ئێسكەكانم سیس ولاوازبوون وهێزوپێزم نەماوە ﴿واشتعل الرأس شيبا﴾ و هەموو سەریشم لەبەرپیری شۆڵە وتروسكەی دێ ﴿ولم اكن بدعائك ربي شقيا﴾ پەروەردگارم! تابۆمەبەستەكانم لێت پاڕابیمەوە، هەرگیز دڵشكاوو بێهیوا نەبووم، واتە: ئێستایش لوتفت بێ لە كەڵم ﴿[5] وإني خفت الموالي من ورائي﴾ و بەڕاستیی من لە دوایخۆم لە هۆزو عەشیرەت وخزمانم نیگەرانم،كە وەك پێویست نەزانن ڕێز لە پەیامبەرێتی و زانست بگرن ﴿وكانت امرأتي عاقرا﴾ وخۆشت ئاگاداریی وچاك دەزانیت كەهاوسەرەكەیشم نەزۆكە ﴿فهب لي من لدنك وليا﴾ دەساتۆ لەگەڵ ئەوەیشدا لەمیهرەبانیی خۆت، نەك بەپێی

باوونەرێت منداڵێکی چاکم پێببەخشە، تا ببێ بەجێگەدارم ورێز لەوخانەوادەو مەقامە بگرێ ﴿[٦] يرثني ويرث من آل يعقوب﴾ ومیراتی من وخانەدانی یەعقووب وەرگرێ وببێتە جێنشینمان و، ئیش وکارەکانیش بگرێتە دەست. جاقسەی ڕاست لەم جێگایەدا ئەوەیکە: مەبەست بەومیراتە لەزەکەریای بگرێ، میراتی پێغەمبەرایەتییە، نەك میراتی ماڵ ودارایی، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((إنا مَعْشَرَ الأنبياء لا نُورَثُ، ما تركناه صَدَقَةٌ)) واتە:هەرگیز میرات لە ئێمەی دەستەی پێغەمبەران ناگیردرێ و،هەرچیمان پاش خۆمان بەجێهێشت دەبێتە خێرو صەدەقەودەدرێتە (بیت المال)ی موسڵمانان/ بوخاریی: في الفرائض (٦٢٢٧). و دەفەرموێ: (إنَّ العلماءَ وَرَثَة الأنبياء لم يُوَرِّثُوا دينارا ولادرهما وَرَّثُوا العِلْمَ)) واتە: بێگومانە کەگشت زانایان میراتگرو جێنشینی پێغەمبەرانن، دیارەکە پێغەمبەرانیش دینارو درهەمیان وەپاش نەکەوتووە، بەڵکو زانستوزانیارییان وەپاش خستووە. ئەبووداوود (٣٦٤١). وە هەروەها لەتەفسیری ئایەتی: (وورث سليمان داود) دا، زاناکان بەدەرلە زانایانی شیعە هەمان رایان هەیە ﴿واجعله رب رضيا﴾ ئەی پەروەردگاری من! هیوامە خۆت وبەندەچاکەکانت لەکردارو هەڵسوکەوتی رازیی بن.

**خوا دوعاکەی زەکەریای قەبوڵکردو یەحیای پێبەخشی:**

لەم چەند ئایەتەدا خوای دلۆڤان، وەڵامی زەکەریا دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿[٧] يا زكريا إنا نبشرك بغلام﴾ ئەی زەکەریا! بەراستیی ئێمە مژدەی کوڕێکت دەدەینێ ﴿اسمه يحيى﴾ ناوی یەحیایە ﴿لم نجعل له من قبل سميا﴾ کە بەرلەو، ناوی وانەبووەو کەسمان هاوناوی ئەونەکردووە ﴿[٨] قال رب انى يكون لى غلام﴾ زەکەریا لەخۆشیا گوتی: پەروەردگارم! جاکوا لەم تەمەنەدا من کوڕم دەبێ ﴿وكانت امراتى عاقرا﴾ وژنەکەشم نەزۆکە ﴿وقد بلغت من الكبر عتيا﴾ وخۆیشم لەبەر پیری کەلەلام وجومگەکانی لەشم تەواو لاوازن وئوفتادە بووم. تەفسیرەکان دەڵێن: تەمەنی زەکەریا ئەوحەلە (١٢٠) ساڵ بوو و، تەمەنی خێزانەکەیشی (٩٨) ساڵ! ﴿[٩] قال كذلك﴾ پەیامهێنەکەی خواگوتی" بڕیار ئاوایە پێم گوتی ﴿قال ربك هو على هين﴾ پەروەردگاریشت دەفەرموێ: سەری سوورنەمێنێ، چونکە ئەم کارە لای من زۆر ئاسانە ﴿وقد خلقتك من قبل ولم تك شيئا﴾ خۆ لەپێش یەحیاشدا خۆتم هەر لەنەبوون دروستکردو هیچ شتێ نەبوویت، واتە: هەروەکو تۆم لەنەبوونەوە بەدی هێنا، هەرئاواش دەتوانم (یەحیا)ت بۆبەدیبێنم ﴿[١٠] قال رب اجعل لى آية﴾ زەکەریا بۆدڵنیایی خۆی گوتی: ئەی پەروەردگارم! بۆ زکپڕبوونی هاوسەرەکەم نیشانەیەکم بۆ بەدی بێنە ﴿قال آيتك الا تكلم الناس ثلاث ليال سويا﴾ خوا فەرمووی: نیشانەوبەڵگەی هاتنەدی ئەومژدەیە ئەوەیە تا سێ شەوان و سێ رۆژان بێ ئەوە هیچ وەیەکت هەبێ ناتوانی قسە لەگەڵ خەڵکدا بکەیت ﴿[١١] فخرج على قومه من المحراب﴾ جادوای ئەوکارەساتە بە دڵنیا ییەکەوە لەمیحرابی نوێژەکەیەوە چووە دەرەوەو روویکردە هۆزو پەیرەوکەرانی خۆی. (محراب) هەندێ ئەڵێن: لە(حرب)ەوە وەرگێراوە، وەك بڵێی: پیاوی (میحراب) هەمیشە لەگەڵ شەیتان و هەواو ئارزوودا لە جەنگایە هەندێ دیکە ئەڵێن: لە (حەرەب)ەوە هاتووە: وەك بڵێیت: پیاوی میحراب هەمیشە خەستەو ماندووە! ﴿فأوحى إليهم ان سبحوا بكرة وعشيا﴾ بەهێما وئاماژە پێیگوتن لەبەرامبەر بەخششەکانی خواوە بەیانیان و ئێواران هەر تەسبیحاتی خوا بڵێن و، خەریکی ویردو ئەورادبن.

**پەسنی یەحیاو لەدایکبوونی:**

هەرکە یەحیا لەدایکبوو و،پاشان گەورە بوووگەیشتە ئەوتەمەنەی کە فەرمانی پێغەمبەرێتی پێبدرێ، پێمان گوت: ﴿[١٢] يا يحيى خذ الكتاب بقوة﴾ ئەی یەحیا! بەهەرچی تواناتە ئەو نامەی تەوراتە بگرەو کاروڕەفتاری پێبکە

﴿وآتيناه الحكم صبيا﴾ وهێشتا هەر زاڕۆو منداڵ بوو، بیر تیژیی‌و زرنگیی وکارزانیمان پێبەخشی بۆ تێگەشتنی ئایین ﴿[١٣] وحنانا من لدنا وزكاة﴾ لەگەڵ دڵسۆزیی‌و پاكژیی لەلایەن خۆمانەوە ولە کرداری نا پەسەندیش پاکمان کردەوەو دوورمان خستەوە ﴿وكان تقيا﴾ وەکەسێکی لەخواترس وپارێزگاریش بوو، هەرگیز بۆ کاری خراپە بیری نەئەکردەوە ﴿[١٤] وبرا بوالديه﴾ وە لەگەڵ باوك ودایکیشیا چاك رەفتارو جوان گوفتاربوو ﴿ولم يكن جبارا عصيا﴾ هەرگیز دەعیەبازو یاخیی وسەرپێچی کەرنەبوو بەرامبەر فەرمانەکانی خوا ﴿[١٥] وسلام عليه يوم ولد﴾ درووودوسڵاوی لێبێ رۆژێ کەلەدایکبووە ﴿ويوم يموت﴾ و رۆژێ دەمرێ ﴿ويوم يبعث حيا﴾ و رۆژێکیش زیندوو ئەکرێتەوە وهەڵدەستێ.

## مەریەم و لە دایەکبوونی عیسا:

﴿[١٦] واذكر فى الكتاب مريم﴾ لەم قورئانەدا باس و یادی (مەریەم)یش بکە ، لەم باسەدا داستانێکی سەر سوڕهێنەردەبیسیت! ﴿إذانتبذت من اهلها مكانا شرقيا﴾ کاتێ دوورلەکەس وکاری کەناریگرت وجێگایەکی خۆرەڵاتی بۆ خۆی هەڵبژارد بۆ خواپەرستیی، واتە: لەبەشی خۆرهەڵاتی قودسدا ﴿[١٧] فاتخذت من دونهم حجابا﴾ لەنێوان خۆی وئەواندا پەردەیەکی دانا تاچاکتر بتوانێ خواپەرستیی بکات ﴿فأرسلنا إليها روحنا﴾ ئێمەیش رۆحی خۆمان (جوبرەئیل) ناردەلای ﴿فتمثل لها بشرا سويا﴾ ئەوسا لەسیمای پیاوێکدا نەك لە شێوەی فریشتەدا خۆی نیشاندا وهاتە بەرچاوی تا نەترسێ وکارەکەی لاقورس نەبێت ﴿[١٨] قالت إنى اعوذ بالرحمن منك﴾ کاتێ کە چاوی پێکەوت ترسا خراپەکاربێت بۆیە گوتی: بەراستیی من پەنا دەبەمەبەر خوای بەبەزەیی لەزەرەرو زیانی تۆ ﴿إن كنت تقيا﴾ دەسائەگەر تۆکەسێکی خۆپارێزو لەخوا ترسبيت لێمەوە نزيك مەبە ﴿[١٩] قال إنما انا رسول ربك﴾ جوبرەئیل وتی: مەترسە بەراستیی من تەنها هەر ڕەوانەکراوی پەروەردگاری تۆم ئەو کەسە نیم لێی ئەترسیت ﴿لأهب لك غلاما زكيا﴾ هاتووم بەفەرمانی خوا کوڕێکی چاك و پاکت پێببەخشم ﴿[٢٠] قالت انى يكون لى غلام﴾ مەریەم وتی: جامن چۆن کوڕم ئەبێ؟! ﴿ولم يمسنى بشر﴾ کە تا ئێستا شوم نەکردووە وهیچ کەسێك دەستی لێنەداوم ﴿ولم اك بغيا﴾ و هەرگیز کەسێکی داوێن پیسیش نەبووم ﴿قال كذلك﴾ جوبریل وتی: بڕیار بەم شێوەیە ﴿[٢١] قال ربك هو على هين﴾ و پەروەردگاری تۆ فەرموویە: ئەم کارە بەخشینی منداڵ بێ شووکردن بۆمن ئاسانە ﴿ولنجعله آية للناس﴾ بۆئەوەی بیکەینە ئایەت و نیشانەیەك بۆمەردوم لەسەر دەسەڵاتی خۆم ﴿ورحمة منا﴾ چاکەو میهرەبانییەکیش بێت لەئێمەوە، چونکە ئەو منداڵە دەکەمە پەیامبەرو رێ نیشاندەر ﴿وكان امرا مقضيا﴾ ئەم مەسەلەیەش بڕیارێکی بڕاوەیە و هەر پێش دێ، بەهیچ شێوەیەك ناگۆڕێ و قسەی ناوێ.

الجزء السادس عشر — سورة مريم

يَٰيَحْيَىٰ خُذِ ٱلْكِتَٰبَ بِقُوَّةٍۢ ۖ وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْحُكْمَ صَبِيًّا ﴿١٢﴾
وَحَنَانًا مِّن لَّدُنَّا وَزَكَوٰةً ۖ وَكَانَ تَقِيًّا ﴿١٣﴾ وَبَرًّۢا بِوَٰلِدَيْهِ وَلَمْ
يَكُن جَبَّارًا عَصِيًّا ﴿١٤﴾ وَسَلَٰمٌ عَلَيْهِ يَوْمَ وُلِدَ وَيَوْمَ يَمُوتُ
وَيَوْمَ يُبْعَثُ حَيًّا ﴿١٥﴾ وَٱذْكُرْ فِى ٱلْكِتَٰبِ مَرْيَمَ إِذِ ٱنتَبَذَتْ
مِنْ أَهْلِهَا مَكَانًا شَرْقِيًّا ﴿١٦﴾ فَٱتَّخَذَتْ مِن دُونِهِمْ حِجَابًا
فَأَرْسَلْنَآ إِلَيْهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرًا سَوِيًّا ﴿١٧﴾ قَالَتْ إِنِّىٓ
أَعُوذُ بِٱلرَّحْمَٰنِ مِنكَ إِن كُنتَ تَقِيًّا ﴿١٨﴾ قَالَ إِنَّمَآ أَنَا۠ رَسُولُ
رَبِّكِ لِأَهَبَ لَكِ غُلَٰمًا زَكِيًّا ﴿١٩﴾ قَالَتْ أَنَّىٰ يَكُونُ لِى
غُلَٰمٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِى بَشَرٌ وَلَمْ أَكُ بَغِيًّا ﴿٢٠﴾ قَالَ كَذَٰلِكِ
قَالَ رَبُّكِ هُوَ عَلَىَّ هَيِّنٌ ۖ وَلِنَجْعَلَهُۥٓ ءَايَةً لِّلنَّاسِ وَرَحْمَةً
مِّنَّا ۚ وَكَانَ أَمْرًا مَّقْضِيًّا ﴿٢١﴾ ۞ فَحَمَلَتْهُ فَٱنتَبَذَتْ
بِهِۦ مَكَانًا قَصِيًّا ﴿٢٢﴾ فَأَجَآءَهَا ٱلْمَخَاضُ إِلَىٰ جِذْعِ ٱلنَّخْلَةِ
قَالَتْ يَٰلَيْتَنِى مِتُّ قَبْلَ هَٰذَا وَكُنتُ نَسْيًا مَّنسِيًّا ﴿٢٣﴾
فَنَادَىٰهَا مِن تَحْتِهَآ أَلَّا تَحْزَنِى قَدْ جَعَلَ رَبُّكِ تَحْتَكِ سَرِيًّا ﴿٢٤﴾
وَهُزِّىٓ إِلَيْكِ بِجِذْعِ ٱلنَّخْلَةِ تُسَٰقِطْ عَلَيْكِ رُطَبًا جَنِيًّا ﴿٢٥﴾

حزب ٣١

فكلي واشربي — ٣٠٦

**منداڵ لە تۆلی مەریەمدا دروستبوو:**

﴿[٢٢] فحملته فانتبذت به مكانا قصيا﴾ بەڵێ دوای وتووێژەکەی جوبریل، مەریەم خۆی دایە دەستی قەزای خوا و، جوبریلیش بە فەرمانی خوا فووی پیاکردو دەست بەجێ سکی پڕبوو بەوکۆرپە پاك وچاکەیە، ئینجا لە (بیت المقدس) کەهێشتا منداڵەکە لە سکیا بوو بەغەم و پەژارەیەکی زۆرەوە خۆیگەیاندە شوێنێکی دوور، نەوەك تانەو تەشەری لێ بدەن وتۆمەتباری بکەن ﴿[٢٣] فأجاءها المخاض إلى جذع النخلة﴾ ئینجا ژانی منداڵبوون گرتیی وبردییە لای‌بنە دارخورمایەك, تالە کاتی منداڵبووندا لێی بخواو، پاڵیشی پێوە بدات ﴿قالت يا ليتنى مت قبل هذا﴾ ئەوسا لەبەر پەرێشانی وحەیاو شەرمی خۆی گوتی: خۆزگایە پێش ئەم رووداوە مردبام ﴿وكنت نسيا منسيا﴾ وبەیەکجاری لەبیر بچوومایە وەو، هەرگیز باس نەکرابام ﴿[٢٤] فناداها من تحتها﴾ جا ئەومنداڵە کەلە داوێنی بەرۆبوو بانگی لە مەریەم کردوو وتی: دایەگیان! ﴿الا تحزنى﴾ دڵ زویرمەبە وخەفەت مەخۆ بەم رووداوە ﴿قد جعل ربك تحتك سريا﴾ بێگومان پەروەردگارت لوتفی لەگەڵ کردوویت و لەخوار پێتەوە جۆگە ئاوێکی باشی پێکهێنا ﴿[٢٥] وهزى إليك بجزع النخلة﴾ وە نیشانەیەکی‌تری پایە بەرزیت لای‌خوا ئەوەیە: لقی ئەو کۆتەرە دارخوما وشکەیە بهەژێنە ﴿تساقط عليك رطبا جنيا﴾ فەریکە خورمای تەڕو تازەپێگەیشتووت بە سەردا دەوەرێنێ، چەندە ئارەزوو ئەکەیت بخۆ، کەواتە هەر ئەو کەسە کەئەم کارانەت بۆئەکا ئەشتوانێ بە نائاسایی منداڵت پێبدات ﴿[٢٦] فكلى واشربى وقرى عينا﴾ لەوفەریکە خورمایە بخۆو لەو ئاوەیش بخۆرەوە، دەروونت ئاسوودەبێ ﴿فإما ترين من البشر أحدا﴾ ئینجا هەر کەسێکیشت دی‌و پرسیاری ئەم منداڵەی لێکردی ﴿فقولي إنى نذرت للرحمن صوما﴾ بەهێماو ئامارژە بێژە پێی: بەراستیی من بۆخوای بەبەزەیی بڕیاری بێ دەنگیم داوەو نەزرمکردووە ﴿فلن اكلم اليوم إنسيا﴾ کە ئەمڕۆ لەگەڵ هیچ کەسێکدا قسە نەکەم، ئەوکوڕەش خۆی گفتوگۆتان لەگەڵ دەکاو وەڵامتان دەداتەوە.

الجزء السادس عشر — سورة مريم

فَكُلِي وَٱشْرَبِي وَقَرِّي عَيْنًا فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ ٱلْبَشَرِ أَحَدًا فَقُولِيٓ
إِنِّي نَذَرْتُ لِلرَّحْمَٰنِ صَوْمًا فَلَنْ أُكَلِّمَ ٱلْيَوْمَ إِنسِيًّا ﴿٢٦﴾
فَأَتَتْ بِهِۦ قَوْمَهَا تَحْمِلُهُۥ قَالُوا۟ يَٰمَرْيَمُ لَقَدْ جِئْتِ شَيْـًٔا
فَرِيًّا ﴿٢٧﴾ يَٰٓأُخْتَ هَٰرُونَ مَا كَانَ أَبُوكِ ٱمْرَأَ سَوْءٍ وَمَا كَانَتْ
أُمُّكِ بَغِيًّا ﴿٢٨﴾ فَأَشَارَتْ إِلَيْهِ قَالُوا۟ كَيْفَ نُكَلِّمُ مَن كَانَ فِى
ٱلْمَهْدِ صَبِيًّا ﴿٢٩﴾ قَالَ إِنِّى عَبْدُ ٱللَّهِ ءَاتَىٰنِىَ ٱلْكِتَٰبَ وَجَعَلَنِى
نَبِيًّا ﴿٣٠﴾ وَجَعَلَنِى مُبَارَكًا أَيْنَ مَا كُنتُ وَأَوْصَٰنِى بِٱلصَّلَوٰةِ
وَٱلزَّكَوٰةِ مَا دُمْتُ حَيًّا ﴿٣١﴾ وَبَرًّۢا بِوَٰلِدَتِى وَلَمْ يَجْعَلْنِى
جَبَّارًا شَقِيًّا ﴿٣٢﴾ وَٱلسَّلَٰمُ عَلَىَّ يَوْمَ وُلِدتُّ وَيَوْمَ أَمُوتُ
وَيَوْمَ أُبْعَثُ حَيًّا ﴿٣٣﴾ ذَٰلِكَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ قَوْلَ ٱلْحَقِّ
ٱلَّذِى فِيهِ يَمْتَرُونَ ﴿٣٤﴾ مَا كَانَ لِلَّهِ أَن يَتَّخِذَ مِن وَلَدٍ سُبْحَٰنَهُۥٓ
إِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٣٥﴾ وَإِنَّ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبُّكُمْ
فَٱعْبُدُوهُ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٣٦﴾ فَٱخْتَلَفَ ٱلْأَحْزَابُ مِنۢ
بَيْنِهِمْ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن مَّشْهَدِ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿٣٧﴾ أَسْمِعْ بِهِمْ
وَأَبْصِرْ يَوْمَ يَأْتُونَنَا لَٰكِنِ ٱلظَّٰلِمُونَ ٱلْيَوْمَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٣٨﴾

٣٠٧

**منداڵی بوو و هێنایەوە لای خزمان و کەوتنە چەوت و چیرە:**

﴿[٢٧] فأتت به قومها تحمله﴾ ئینجا مەریەم ملی راکێشا بۆفەرمانی خواو هاتەوە بۆلای خزم و کەس وکارو دۆستانی و، منداڵێکیش بە باوەشیەوە بوو! ﴿قالوا يا مريم لقد جئت شيئا فريا﴾ کە ئەوەیان دیت هەموو بە سەرسوڕمانەوە گوتیان: مەریەم! بەراستیی کارێکی سەیر وسەمەرەو ئابڕوبەرت ئەنجامداوە ﴿[٢٨] يا أخت هارون ماكان أبوك امرأ سوء﴾ ئەی خوشکی هاروون! ئەی ئەوەی لەصەلاحەتدا لەهاروون دەچیت! خۆ تۆ نە باوکت پیاوێکی خراپکار بوو ﴿وما كانت امك بغيا﴾ و نەدایکیشت بەدکارو و داوێن پیس بوو، ئەی ئیتر ئەم منداڵەت

لەکوێ هێنا؟ ﴿[٢٩] فأشارت إليه﴾ مەریەمیش هیچی نەگوت: بەڵکو ئاماژەی بۆ عیسا کرد، واتە: لەگەڵ ئەودا قسە بکەن و ئەو وەڵامتان بداتەوە ﴿قالوا كيف نكلم من كان في المهد صبيا﴾ ئەوانیش بە سەرسورمانێکەوە وتیان: جا چۆن ئێمە لەگەڵ منداڵێکی ساوای نێولانك و سەربێشکەدا قسە بکەین؟ ئەم لاقرتیی وگاڵتەیە چییە؟ ﴿[٣٠] قال إني عبدالله﴾ لەناکاو عیسا هاتەگفت و وتی: بەڵێ من بەندەی خوام، بەدەسەڵاتی خۆی بێباوك دروستی کردووم ﴿آتاني الكتاب وجعلني نبيا﴾ نامەم پێ ئەداو دەشمکاتە پەیامبەر ﴿[٣١] وجعلني مباركا أينما كنت﴾ لە هەرجێگایەکیشدا ببم پیرۆزم دەکا ﴿و اوصاني بالصلاة والزكاة ما دمت حيا﴾ رایشی سپاردووم هەتا ماوم نوێژ بکەمو زەکات بدەم ﴿[٣٢] وبرا بوالدتي﴾ و چاکەکار وگوێ لەمستی دایکیشم بم ﴿ولم يجعلني جبارا شقيا﴾ نەشی کردووم بە زۆردارێکی ملهوڕ ﴿[٣٣] والسلام علي يوم ولدت ويوم أموت و يوم أبعث حيا﴾ وە سڵاوو درودی خوام لەسەربێ، رۆژێ لەدایکبووم و، رۆژێ کە ئەمرم و، رۆژێکیش زیندوو ئەکرێمەوە.

**قسەی راست: عیسا بەندەی خوایە:**

﴿[٣٤] ذلك عيسى ابن مريم﴾ ئەو وەسفکراوە بەم سیفەتانە عیسای کوڕی مەریەم بوو ﴿قول الحق الذي فيه يمترون﴾ قسەی راستیش دەربارەی ئەو هەرئەمەیە، کەچی ئەوان تیایدا بەدگومان و دوودڵن، ئەوەتە (نەسارا) بە نەفامیی و بێ بەڵگە دەڵێن: کوری خوایە! جوولەکەکانیش دەڵێن: لەداوێن پیسی پەیدابووە ﴿[٣٥] ماكان لله ان يتخذ من ولد﴾ خۆهەرگیز بۆ خوا ناوەشێتەوە منداڵی هەبێ، چونکە منداڵ لەگەڵ خوایەتیدا ناگونجێت ﴿سبحانه﴾ خوا پاکەو بێخەوشە لەوەی ئەوانە دەیڵێن ﴿إذا قضى امرا﴾ دەسەڵاتدارێکی وایە، هەرکە ویستی بریاری کارێ بدا ﴿فإنما يقول لهكن فيكون﴾ تەنها هەرئەوەندەی دەوێ پێی بڵێ: ببە! ئەویش دەست بەجێ دەبێ و، پێویست بە بەکارهێنانی هۆو سەبەب نیە، هەتا سەر لەشێوەی لەدایکبوونی عیسا بکرێتەوە، وەکو خۆیشی لە سوورەتێکی تردا دەفەرموێ: (إن مثل عيسى عندالله كمثل آدم خلقه من تراب ثم قال لهكن فيكون) ٣/٥٩ ﴿[٣٦] وإن الله ربي وربكم فاعبدوه﴾ بێگومانبن هەر خوایە پەروەردگاری من و، پەروەردگاری ئێوەش، کەوا بوو هەر بەتەنیا ئەو بپەرستن و هاوتا و هاوەڵی بۆ دامەنێن ﴿هذا صراط مستقيم﴾ هەرئەمەیشە رێگاو رێبازی راست و دروست کە من وەسیەتم بۆ کردن، دەسا ئێوەش بەردەوام لەسەری بچن ﴿[٣٧] فاختلف الأحزاب من بينهم﴾ کەچی لەگەڵ ئەوەیشدا هەردوای عیسا هیندێ لەوگروپ ودەستانە لەنێوان خۆیاندا سەبارەت بەعیسا ناکۆکیی و دوودەنگی و راوبۆچوونی جیاوازیان بوو هەیان بوو پێی وابوو عیسا کوڕی خوایە! هەیشبوو ئەیوت: لە داوێن پیسی پەیدا بووە!

هەر بۆیە ئیمپراتۆری رۆمانی (قوستەنتین) ناو، کۆرێکی بۆ (٢١٧٠) قەشە بەست سەبارەت بە شێوەی لە دایکبوونی عیسا، دەرنجام کەوتنە ناو مشت ومڕێکی ئێجگار ئاڵۆزەوە.. هەندێکیان وتیان: عیسا خوایەو هاتۆتە سەر زەویی، کێ بژیەنی دەیژیەنێ و، ویستی لە هەرکەسیش بێ، دەیمرێنێ، لە پاشان سەرکەوتۆتەوە بۆ ئاسمان! هەندێکی تر وتیان: یەکێکە لەو سێ شتەی (الأقانيم الثلاثة) کە خوایان لێ پێکهاتووە: (الأب والإبن و الروح القدس!) برێکی تریان وتیان: یەکێکە لەسێ خواکە: (الله، عیسا، دایکی عیسا)! دەستەیەکیتر گوتیان: نەخێر، بەندەو پەیامبەرو فەرمانو وشەی خوایە.. وەهەروەها هەریەکە بۆچوونی خۆی دەربڕی و، بە ئەنجام نەگەیشتن و، وتەکانیان بە دڵی ئیمپراتۆر نەبوون و بڵاوەی پێکردن، بەدەر لەکۆمەڵێکی کەمیان، ئەوانەیان گوتیان: عیسا کوڕی مەریەمەو خوای کارزان پێیبەخشیوە ﴿فويل للذين كفروا من مشهد يوم عظيم﴾ دەسا ئاهو ناڵە وسزا بۆئەوکەسانەیە کەبە حیساب و کیتابی رۆژەگەورەو سەختەکەی قیامەت کافرو بێ بڕوان. (عوبادەی کوڕی سامیت)

دەڵێت پێغەمبەر فەرمووی: ((مَنْ شهد أن لا إله إلا الله وحده لاشريك له، و أن محمدا عبده و رسوله، وأن عيسى عبدُالله ورسولهُ وكلمتُهُ ألقاها إلى مريم وروحٌ منه، وأن الجنة حقٌ، والنار حقٌ، أدخله الله الجنةَ على ماكان من العمل)) بوخاريی٦/٥٧، واتە: هەرکەسێ شایەدی بدا کە: خوا تاك وتەنیایەو، موحەممەد بەندەو پێغەمبەری خوایەو، (عیسا)ش هەر بەندەو پێغەمبەریخوایەو، بە وشەوفەرمانی ئەو بووەو، هاویشتوویە بۆ مەریەم و، رۆحی خوایەو بەفەرمانی ئەو بووەو، بشلێت بەهەشت راستەو، ئاگری دۆزەخ راستە، ئەوا خوا دەیباتە بەهەشتەوە، ئیتر کاروکردەوەی هەرجۆر بووبێ ﴿[38] اسمع بهم وابصر يوم ياتوننا﴾ ئەگەر چی ئەوانە ئەمرۆ لەدنیادا هەق وراستییەکان نابینن، بەڵام ئەو رۆژە کەدێنەلامان، زۆر چاك دەبیسن و زۆر چاك دەبینن! واتە: ناتوانن بەهیچ جۆرێك خۆیان لەراستییەکان لابدەن، بۆیە بەراشکاوی دەڵێن: (ربنا أبصرنا و سمعنا فارجعنا..) ١٢/٣٢ ﴿لكن الظالمون اليوم فى ضلال مبين﴾ بەڵام ئەمرۆکە هێشتا لەدنیادان ستەمکارەکان لەسەرلێشێواوییدان و راستیی نابینن و، هەق نابیسن و دوای هەق ناکەون ﴿[39] وانذرهم يوم الحسرة﴾ وە لە رۆژی ئاهوو ناڵەو خەم و خەفەت و پەشیمانی (يوم الحسرة) ئاگاداریان بکەو بیانترسێنە ﴿إذ قضي الأمر﴾ ئەوحەلە لەلایەن خوای پەروەرێنەوە بریار دەدرێ کە: دەستەیەك بۆ بەهەشت و، دەستەیەکیش بۆ دۆزەخ رەوانە بکرێن ﴿وهم فى غفلة﴾ کەچی ئەوانە هێمان لە غەفلەتدان و،بەخۆیان نەزانیوە﴿وهم لايؤمنون﴾ وخۆشیان لە بڕوا بواردووەو، ددان بەزیندوو بوونەوەو پاداشت و تۆڵەشدا نانێن. ئیمامی (تەبەریی) بۆپشتگیری ئەو راستییە ئەم فەرموودەیە دێنێ و دەفەرموێ: ((فليس نَفْسٌ إلا وهى تنظر الى بيت فى الجنة وبيت فى النار، وهو يومُ الحسرة، فيرَى أهلُ النار البيتَ الذى فى الجنة، فيقال لهم: لو عملتم، فتأخذهم الحسرة، قال: ويرى أهلُ الجنة البيتَ الذى فى النار فيقال: لولا أن من الله عليكم..))واتە: هەمووکەسێك تەماشایماڵێك لەبەهەشتداو، ماڵێ لەئاگردا دەکا دیارە ئەو رۆژەیە، رۆژی داخ و کەسەر ئەوسا کەدۆزەخییەکان ئەوماڵە رازاوە لەبەهەشتدا دەبینن، پێیان دەگوترێت: خۆزگە! لەدنیادا کارتان بۆ دەکردو ئێستا دەبوویە ماڵی ئێوە ئەوسا خەمو خەفەت دایان دەگرێت! لەولاشەوە کەبەهەشتیەکان ئەو ماڵ و جێگایە لەدۆزەخدا ئامادەکراوە دەبینن، پێیان دەگوترێت: ئەگەر خوا فەزڵ و منەتی نەکردبا بەرامبەرتان ئێستا دۆزەخ جێگای ئێوەش دەبوو! تەبەریی: ١٧/ ٨٨ ﴿[40] إنا نحن نرث الأرض ومن عليها﴾ بێ تاقەت مەبە لێیان، چونکە بێگومانە کە سەرئەنجام ئەم زەوییە وهەرچیش وابە سەریەوە بۆدواجار هەر بۆئێمە دەمێنێت ﴿والينا يرجعون﴾ و گشتیشتان دەگێردرێنەوە بۆلای ئێمە، جائیتر ئەو کاتە هەرکەسە بەپێی شیاویی کردەوەکانی خۆی پاداشت وتۆڵە وەرئەگرێ.

الجزء السادس عشر — سورة مريم

وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ الْحَسْرَةِ إِذْ قُضِيَ الْأَمْرُ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ وَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ
(٣٩) إِنَّا نَحْنُ نَرِثُ الْأَرْضَ وَمَنْ عَلَيْهَا وَإِلَيْنَا يُرْجَعُونَ (٤٠) وَاذْكُرْ
فِي الْكِتَابِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّهُ كَانَ صِدِّيقًا نَّبِيًّا (٤١) إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ يَا أَبَتِ
لِمَ تَعْبُدُ مَا لَا يَسْمَعُ وَلَا يُبْصِرُ وَلَا يُغْنِي عَنكَ شَيْئًا (٤٢) يَا أَبَتِ
إِنِّي قَدْ جَاءَنِي مِنَ الْعِلْمِ مَا لَمْ يَأْتِكَ فَاتَّبِعْنِي أَهْدِكَ صِرَاطًا
سَوِيًّا (٤٣) يَا أَبَتِ لَا تَعْبُدِ الشَّيْطَانَ إِنَّ الشَّيْطَانَ كَانَ لِلرَّحْمَٰنِ
عَصِيًّا (٤٤) يَا أَبَتِ إِنِّي أَخَافُ أَن يَمَسَّكَ عَذَابٌ مِّنَ الرَّحْمَٰنِ
فَتَكُونَ لِلشَّيْطَانِ وَلِيًّا (٤٥) قَالَ أَرَاغِبٌ أَنتَ عَنْ آلِهَتِي
يَا إِبْرَاهِيمُ لَئِن لَّمْ تَنتَهِ لَأَرْجُمَنَّكَ وَاهْجُرْنِي مَلِيًّا (٤٦) قَالَ
سَلَامٌ عَلَيْكَ سَأَسْتَغْفِرُ لَكَ رَبِّي إِنَّهُ كَانَ بِي حَفِيًّا (٤٧)
وَأَعْتَزِلُكُمْ وَمَا تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ وَأَدْعُو رَبِّي عَسَىٰ
أَلَّا أَكُونَ بِدُعَاءِ رَبِّي شَقِيًّا (٤٨) فَلَمَّا اعْتَزَلَهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ
مِن دُونِ اللَّهِ وَهَبْنَا لَهُ إِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَكُلًّا جَعَلْنَا نَبِيًّا (٤٩)
وَوَهَبْنَا لَهُم مِّن رَّحْمَتِنَا وَجَعَلْنَا لَهُمْ لِسَانَ صِدْقٍ عَلِيًّا (٥٠)
وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ مُوسَىٰ إِنَّهُ كَانَ مُخْلَصًا وَكَانَ رَسُولًا نَّبِيًّا (٥١)

٣٠٨ وَنَادَيْنَاهُ مِن

**باسێکی ئیبراهیم و پەندی بۆ بابی:**

﴿[٤١] واذكر في الكتاب إبراهيم﴾ لەم قورئانەدا گۆشەیەك لە یادو باسی ئیبراهیمیش بۆ هۆزەکەت بگێرەوە ﴿إنه كان صديقا نبيا﴾ کە بە راستیی ئەو کەسایەتییەك بووە هەردەم لەکارو وتاریدا زۆر راستگۆ وپەیامبەری خوایش بوو هەرگیز درۆی نەدەکرد، بتی نەدەپەرست، جا کەوایە بابەتایبەت عەرەبەکان -کە خۆیان بەنەوەی ئەودەزانن- چاوی لیْبکەن و، ئتیر بتیش نەپەرستن ﴿[٤٢] إذ قال لأبيه يا ابت﴾ ئەو دەمەی بەباوکی خۆی (ئازەر) وت: بابە! ﴿لم تعبد ما لايسمع ولا يبصر﴾ تۆ بۆچی شتێکی وا ئەپەرستی کە نەئەبیسێ و، نەئەبینێ؟! ﴿ولا يغني عنك شيئا﴾ ونە ئەیشتوانێ لە کاتی تەنگانەدا هیچ زیانێکت لێوە دوورخاو بێنیازت کا ﴿[٤٣] يا ابت إني قد جاءني من العلم مالم يأتك﴾ بابە! بێگومانبە من هەندێ شت دەزانم لەبارەی زیندووبوونەوەو سزای بت پەرستان -کە لە لایەن خواوە بۆم هاتووە- بۆ تۆ نەهاتووە، ﴿فاتبعني اهديك صراطا سويا﴾ جا داوات لێ ئەکەم لەمن پەیڕەوی بکە، شارەزای ریگەیەکی راستت دەکەم ﴿[٤٤] يا ابت لا تعبد الشيطان﴾ بابە! شەیتان مەپەرستە، گوێرایەلیی مەکە، بتانیش مەپەرستە ﴿إن الشيطان كان للرحمن عصيا﴾ چونکە شەیتان لەفەرمانی خوای بەخشندە یاخیبووە، ﴿[٤٥] يا ابت إني اخاف ان يمسك عذاب من الرحمن﴾ بابە! بەراستیی من لەوەئەترسم ئەگەر تۆ بەوحاڵەوە بمری لە خوای میهرەبانەوە تووشی سزایەکی گەورە ببی ﴿فتكون للشيطان وليا﴾ ئەو کاتە ببییە دۆستی شەیتان لەدۆزەخدا ﴿[٤٦] قال اراغب انت عن آلهتي يا ابراهيم﴾ باوکی بەسەختییەکەوە وتی: ئاخۆ ئەی ئیبراهیم! تۆ ئەوەندە بێزاری لە خواکانم؟ ﴿لئن لم تنته لأرجمنك﴾ بێگومان ئەگەر تۆ دەس هەڵنەگریت لەباسکردنی خواکانیمن بە خراپە، لێت قبووڵ ناکەم و بەردە بارانت ئەکەم ﴿واهجرني مليا﴾ دە بۆ ماوەیەکی دوورو دریژیش لێم وەدوور بەو نەتبینم، بەڵێ بابی ئیبراهیم ئا بەوشێوە توندو تیژەیە رووبەرووی ئیبراهیم دەبێتەوە کەچی ئەم هێشتا لەوەڵامدا ﴿[٤٧] قال سلام عليك﴾ وتی: سەلامت لەسەر بێ و، هەرگیز تووشی ناخۆشی نەبیت لەلایەن منەوە, جەماوەری زانایان ئەڵێن: مەبەست بەم (سلاو)ـە, سلاوی لێك پچران وجیابوونەوەیە. هەربۆیەش ئەڵێن: نابێ لە سلاوکردندا دەست پێش خەری بۆکافر بکرێت، وەك دەفەرموێ: (لايبدأ الكافر بالسلام). هەندێکیش ئەڵێن: نەخێر, ئەوسلاوە، سلاوی هەقیقیو وزا لەیەکتر هێنانە، کەوا بوو -وەك (ئیبن عويەينە) ئەڵێ- کافر بەرلەوە سلاوت لێبکات، تۆدەتوانی سلاوی لێ بکەیت. چونکە خوا ئەفەرموێت: (لا ينهاكم الله عن الذين لم يقاتلوكم في الدين ولم يخرجوكم من دياركم أن تبروهم وتقسطوا إليهم..) ٨/٦٠ (قورتوبی) یش ئەم رایەی (ئیبن عويەينە) هەڵئەبژێرێ و، فەرموودەیەکیشی هێناوە، کە ئیمامی بوخاری بە ژمارە (٦٢٥٤) لە (باب الإستئذان)دا ریوایەتی کردووە ﴿ساستغفرلك ربي﴾ لە پەروەردگارم داوای لێبوردنت بۆئەکەم تا لە گوناحەکانت خۆش ببێ، بەڵێ.. ئەدەب و وێڵی کوڕ لەگەڵ باوکدا هەر دەبێ بەم جۆرەیە بێت ﴿إنه كان بي حفيا﴾ چونکە بە راستیی ئەو هەمیشە بەرامبەر من زۆر بە لوتف ومیهرەبانە ﴿[٤٨] و اعتزلكم وما تعبدون من دون الله﴾ وە من لە ئێوەو لەو بتانەش کە لەجیاتی خوا هاواریان بۆ ئەبەن ودەیانپەرستن، کەنارو دوور ئەگرم و، لێتان جیا ئەبمەوە. ﴿وادعو ربي﴾ وە من تەنها پەروەردگارم ئەپەرستم وهاناوهاوار هەر بۆئەو ئەبەم ﴿عسى ان لا اكون بدعاء ربي شقيا﴾ بەو هیواو ئومێدە لە هاوارو بانگم لای پەروەردگارم بێ وەڵام نەبم و دوعاو نزام لێوەرگیرێت.

### ئیسحاق و یاقوب خەلاتی ئیبراهیم کران:

﴿⁴⁹ فلما اعتزلهم وما يعبدون من دون الله﴾ ئینجا کەئیبراهیم وازی لەخۆیان و بتەکانیان هێنا کە ئەوان لەباتی خوا ئەیانپەرستن و لێیان دوورکەوتەوە ﴿وهبنا له إسحاق ويعقوب﴾ لەباتی دوور کەتنەوەی لە باب وکەس وکاری ئێمەش، ئیسحاق ویەعقووبمان پێبەخشی کە زنجیرەی هەموو پەیامبەرەکانی تریش هەر لەمانەوە دەست پێئەکات ﴿وكلا جعلنا نبيا﴾ وهەردووکیشمان کردنە پەیامبەر ونەوەکانیشیان بوونە سەرچاوەو بنەماڵەی پەیامبەران ﴿⁵⁰ ووهبنا لهم من رحمتنا﴾ وە لەرحمەت ومیهرەبانیی خۆیشمان هەموو خێروو چاکەیە کمان پێبەخشین، ماڵ وسامان و زایناریی و دەسەلاَت ﴿وجعلنا لهم لسان صدق عليا﴾ وە زمانی راستگۆیی و چاکبێژیمان بڕیاردا بۆیان وسیفاتی بەرزیانمان خستە سەر زاری مەردوم کە هەتا دونیا دونیابێ هەر بەخێرو باشە باسیان بکەن.

### مووساو هارونی برای:

﴿⁵¹ واذكر في الكتاب موسى﴾ وە هەر لەم کتێبی قورئانەدا باسێکی سیفەتە بەرزەکانی موساش بکە بۆ هۆزەکەت، کە ئەویش هەر لە نەوەی ئیبراهیمە ﴿إنه كان مخلصا﴾ کە بەراستیی کەسێکی هەڵبژێرراوو دڵسۆزی پەروەردگاری بوو ﴿وكان رسولا نبيا﴾ راسپاردەو پەیامبەرێکی گەورەو خاوەن نامەش بوو ﴿⁵² وناديناه من جانب الطور الأيمن﴾ لەلای راستی کێوی (طور)ەوە بانگمان کردو، بەبێ هۆو واسیتەش وتووێژمان لەگەڵ کرد, ئیمامی (تەبەریی) ئەڵێ: ئەو حەلە کە مووسا لە (مەدیەن)ەوە گەڕایەوە بۆ (میسر) کێوەکە ئەکەوتە لای راستییەوە. ﴿وقربناه نجيا﴾ وە لەخۆشمان نزیکمان کردەوە تابەنهێنی قسە و گفتوگۆی لەگەڵ بکەین. ﴿⁵³ ووهبنا له من رحمتنا أخاه هارون نبيا﴾ هەر بە رەحمەت ومیهرەبانیی خۆشمان هارونی برایمان – کە ئەویش هەر پێغەمبەر بوو– پێبەخشی لەسەر داواکەی خۆیی و، کردمانە یاریدەری، چونکە داوای کردبوو لە خوا بە فەرمایشتی, وەك دەفەرموێ: (واجعل لي وزيرا من أهلي هارون أخي) ٢٠/٢٩-٣٠.

### ئیسماعیل ﷺ یاد بکە:

﴿⁵⁴ واذكر في الكتاب إسماعيل﴾ وە لەم کتێبی قورئانەدا یادو باسێکی ئیسماعیلیش کەباوکی عەرەبەکانە بۆ هۆزەکەت بکە ﴿إنه كان صادق الوعد﴾ چونکە ئەو پیاوێکی راستگۆ بوو لەبەڵێنیدا، ئەوە بوو قسەی خۆیشی بردە سەرو خۆڕاگریش بوو لەکاتی بەڵێنی ئامادە بوونیدا بۆ سەربڕینەکە، هەرلەبەرئەوەیشە کە بەتەنها لێرەدا بە (صادق الوعد) ناو دەبرێ ئایەتی: (ستجدني إن شاء الله من الصابرين/ ٣٧/١٠٢) بۆ بەڵێنەکەی ئەو هات و، قسەی خۆیشی راستگۆیانە بردەسەر، جا خوای گەورەش نازناوی (صادق الوعد)ی دایە. بۆیە – بەتایبەتی– مرۆڤی موسڵمان

سُورَةُ مَرْيَمَ — الجُزْءُ السَّادِسَ عَشَرَ

وَنَٰدَيْنَٰهُ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ ٱلْأَيْمَنِ وَقَرَّبْنَٰهُ نَجِيًّا ﴿٥٢﴾ وَوَهَبْنَا لَهُۥ مِن
رَّحْمَتِنَآ أَخَاهُ هَٰرُونَ نَبِيًّا ﴿٥٣﴾ وَٱذْكُرْ فِى ٱلْكِتَٰبِ إِسْمَٰعِيلَ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ
صَادِقَ ٱلْوَعْدِ وَكَانَ رَسُولًا نَّبِيًّا ﴿٥٤﴾ وَكَانَ يَأْمُرُ أَهْلَهُۥ بِٱلصَّلَوٰةِ
وَٱلزَّكَوٰةِ وَكَانَ عِندَ رَبِّهِۦ مَرْضِيًّا ﴿٥٥﴾ وَٱذْكُرْ فِى ٱلْكِتَٰبِ إِدْرِيسَ ۚ
إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقًا نَّبِيًّا ﴿٥٦﴾ وَرَفَعْنَٰهُ مَكَانًا عَلِيًّا ﴿٥٧﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ
أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّۦنَ مِن ذُرِّيَّةِ ءَادَمَ وَمِمَّنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ
وَمِن ذُرِّيَّةِ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْرَٰٓءِيلَ وَمِمَّنْ هَدَيْنَا وَٱجْتَبَيْنَآ ۚ إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ
ءَايَٰتُ ٱلرَّحْمَٰنِ خَرُّوا۟ سُجَّدًا وَبُكِيًّا ۩ ﴿٥٨﴾ ۞ فَخَلَفَ مِنۢ بَعْدِهِمْ
خَلْفٌ أَضَاعُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّبَعُوا۟ ٱلشَّهَوَٰتِ ۖ فَسَوْفَ يَلْقَوْنَ غَيًّا
﴿٥٩﴾ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَأُو۟لَٰٓئِكَ يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ
وَلَا يُظْلَمُونَ شَيْـًٔا ﴿٦٠﴾ جَنَّٰتِ عَدْنٍ ٱلَّتِى وَعَدَ ٱلرَّحْمَٰنُ عِبَادَهُۥ
بِٱلْغَيْبِ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ وَعْدُهُۥ مَأْتِيًّا ﴿٦١﴾ لَّا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا إِلَّا سَلَٰمًا ۖ
وَلَهُمْ رِزْقُهُمْ فِيهَا بُكْرَةً وَعَشِيًّا ﴿٦٢﴾ تِلْكَ ٱلْجَنَّةُ ٱلَّتِى نُورِثُ مِنْ
عِبَادِنَا مَن كَانَ تَقِيًّا ﴿٦٣﴾ وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمْرِ رَبِّكَ ۖ لَهُۥ مَا بَيْنَ
أَيْدِينَا وَمَا خَلْفَنَا وَمَا بَيْنَ ذَٰلِكَ ۚ وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا ﴿٦٤﴾

نصف الحزب ٣١ — سجدة

٣٠٩

دەبێ خاوەنی بەڵێنی خۆی بێ، وەئایەتی: (یا أیها الذین آمنوا لم تقولون مالا تفعلون) ٢/٦١) هەرەشەی پێچەوانەکەیەتی، پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: ((آیة المنافق ثلاث: إذا حدث کذب و إذا وعد أخلف، وإذا أؤتمن خان)) متفق علیه. نیشانەی پیاوی دووڕوو سێ شتە: هەرکاتێ قسە بکا درۆدەکا، کاتێ بەڵێن بدا نایباتە سەر، وە کاتێ سپاردەیەکی درایە دەست گزی لێدەکات. ﴿وکان رسولا نبیا﴾ پەیامبەرێکی خاوەن نامەش بوو، خوا ناردی بۆلای هۆزی جورهەم ونامەکەی باوکی پێراگەیاندن ﴿٥٥ وکان یأمر أهله بالصلاة والزکاة﴾ سەرەڕای خۆیشی، بە هەمیشە وبەردەوام فەرمانیشی ئەدا بەئوممەت و خاوخێزان وبنەماڵەکەی بە نوێژو زەکات کە دووپایەی گرنگن ﴿وکان عند ربه مرضیا﴾ وە هەمیشەیش لای پەروەردگاری خۆی جێی خۆشنوودی ورەزامەندی بوو.

**کورتە باسێکی ئیدریس ؑ:**

﴿٥٦ واذکر فی الکتاب إدریس﴾ و لەم قورئانەدا باسی (ئیدریس)یش بۆ قەوم ونەتەوەکەت بکە ﴿إنه کان صدیقا نبیا﴾ چونکە ئەویش پەیامبەرێکی زۆر راستکارو راستگۆ بوو" باپیرەی نوحیشە، لەدوای ئادەم پێغەمبەرؑ ئەم کراوەتە پەیامبەر، وە لە (٣٠) لاپەڕەدا نامەی پێدراوە، لە هەندێ تەفسیردا ئەڵێن: یەکەم کەسێکە بەخامە نووسیویەتی، یەکەم کەسێکە جل وبەرگی دووراوی لەبەرکردووە، لە حاڵێکا خەڵکی دیکەشت چەرمیان لەبەردەکرد، شیاوی باسە ئێمە ئەم ریوایەتە تەنها هەر بۆ زانیاری دەهێنین، ئەگینا نازانین تاچەندە راستە بەڵام زیاتر لەهەڵبەسراو دەچێ، لەراستیدا جگە لەوەی کە لە قورئان و فەرموودەدا هاتووە، ئێمە ناتوانین هیچ جۆرە شتێکی لەبارەوە بڵێین﴿٥٧ ورفعناه مکانا علیا﴾ وە بەوە مەقامێکی زۆر بەرزیشمان گەیاند، ئەوە بوو لەناوخەڵکدا ئەومان کردە پەیامبەر ؑ ئیمامی (موسلیم) فەرموودەیەکی هێناوە: کە پێغەمبەر ﷺ لەشەوی (میعراج)ـەکەیدا لە ئاسمانی چوارەمدا گەیشت بەئیدریس ؑ وەك دەفەرموێ: (لما عرج بی إلی السماء أتیت علی إدریس فی السماء الرابعة). ﴿٥٨ أولئك الذین أنعم الله علیهم من النبیین﴾ ئەوانە کەلە سەرەتای سورەتەکەوە، هەندێکیان باسکران- لە زەکەریاوە تا ئیدریس کە (١٠) پەیامبەرن - خوای گەورەنازو بەهرەی خۆی بەسەرا رشتن ﴿من ذریة آدم وممن حملنا مع نوح ومن ذریة أبراهیم و إسرائیل وممن هدینا واجتبینا﴾ لە نەوەکانی ئادەم و نەوەی ئەوانەش بوون کە لە گەڵ نوح لە کەشتیەکەدا هەڵمانگرتن وە لە نەوەی ئیبراهیم بوون وەك ئیسماعیل وئیسحاق وە لە نەوەی یەعقوب بوون وەکو پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیل وە لەوانەش بوون رێنمایمان کردبوون وهەڵمان بژاردبوون بۆ پەیامەکانمان.﴿وإذا تتلی علیهم آیات الرحمن﴾ ئەمانە هەرکات ئایەتەکانی خوای بەخشندەیان بەسەرا دەخوێنرایەوە ﴿خروا سجدا و بکیا﴾ بەپەلە دەمەوڕوو دەکەوتنە سەرخاك و سوژدەیان ئەبردو دەم بەکوڵی گریان ئەبوون، چونکە پێغەمبەران سڵاویان لێبێ پترلەخەڵکانی دی لەخوای خۆیان دەترسن و دەیناسن.

**کەسانێ بوونە جێنشینی پێغەمبەران بەلای نوێژدا نەچوون:**

﴿٥٩ فخلف من بعدهم خلف﴾ جالە دوای ئەوان کەسانی لاساری ناشیاو بوونە جێگریان. بەڵێ پەیدابوونی ئەو خەڵکە لارولاسارە لەپاش ئەوپێغەمبەرە نەجیم وخانەدان وبەرێزانەوە جێگەی سەرسوڕمان نییە، چونکە دەگونجێت ئادەمیی هەمووجۆرە توخمێکی لێبکەوێتەوە: خراپ وچاك، راساڵ ولاسار، گێرەشێوێن وچاکساز ﴿أضاعوا الصلاة﴾ ئەوسا نوێژەکانیان زایە کردو بەلایا نەچوون، وەیان زۆر خاووسست بون تێیدا، بۆیە دەستەیەك لەپێشینان وپاشینان وپێشەوا ناودارەکانمان وەکو پێشەوا ئەحمەد وئیمامی شافیعی لەوتەیەکیدا تاریکە صەلا کافر دەکەن بەبەڵگەی ئەو فەرموودەیە پێشەوا موسلیم هێناویەتی﴿واتبعوا الشهوات﴾ وە شوێن ئارەزووی نەفسی

خۆیان کەوتن ﴿فسوف یلقون غیا﴾ ئەوانە تووشی ئازارو زیان دەبن و دەگەن بە تۆڵەی سەر لێشێواییان لە دنیاو لە ئاخیرەتدا.

**بەهەشتی تەوبەکاران و ئاکار چاکان:**

﴿٦٠ إلامن تاب وآمن وعمل صالحاً﴾ مەگەر ئەوانە تەوبە دەکەن و پەشیمان دەبنەوەو بڕوای دامەزراوبە هەق دەهێنن و ئاکاری چاك وباش ئەنجام دەدەن ﴿فأولئك یدخلون الجنة﴾ ئەمانە دەچنە بەهەشتەوە ﴿ولا یظلمون شیئا﴾ و هیچ جۆرە ناهەقیی و ستەمێکیان لێناکرێ ﴿٦١ جنات عدن﴾ بەهەشتێ پڕلە باخ وباخاتە بە هەمیشەیی تێیدا نیشتەجێ ئەبن ﴿التی وعد الرحمن عبادە بالغیب﴾ ئەوەی کەخوای بەخشندە بەڵێنی بە بەندەکانی خۆیداوە، ئەگەرچی بەچاویش نەیان دیتووە، بەڵام ئەوان هەر بڕوایان پێ هێناوەو کاریان بۆکردووە، وا ئەمڕۆش بەخۆشی دەچنە ناویەوە ﴿إنە کان وعدە مأتیا﴾ بێگومان بەڵێنی ئەوپەروەردگارە بە بەهەشت مسۆگەرەو هەر بە ڕێوەیەو، دێتە دی ﴿٦٢ لا یسمعون فیها لغوا إلا سلاما﴾ ئەوسا لەوێدا سەلام نەبێت هیچ چەڵتەو وتەیەکی نابەجێ نابیسن ﴿ولهم رزقهم فیها بکرة وعشیا﴾ لەسەرجەم بەیانیان و ئێوارانیدا رزق وڕۆزی فراوانیان هەیە, خۆراك و خواردن و خواردنەوە، بێ بڕوانەوەو کۆتایی" بێ ماندووبوون و ئەرکێ، دێتە بەردەستیان ﴿٦٣ تلك الجنة التی نورث من عبادنا من کان تقیا﴾ ئائەمەیە ئەو بەهەشت و شوێنەخۆشەی بەبەندەکانی خۆمانی دەبەخشین ودەیانکەینە میرات بۆ پارێزگاران، ئەوانەی سنوورەکانی خوای گەورەیان پاراستووە.

**فریشتە بەفەرمانی خوا نەبێ نایەنە خوار:**

ئیمامی (ترمزیی) لە (ئیبن عەباس)ەوە ئەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی جبریل! ئەوە بۆچی زۆر زۆر نایێت بۆلامان؟! جا بۆ وەڵامی ئەوە ئەم ئایەتە هات: ﴿٦٤ وما نتنزل إلا بأمر ربك﴾ بەفەرمانی پەروەردگارت نەبێ هەرگیز ئێمە دانابەزین ﴿لە ما بین ایدینا وما خلفنا وما بین ذلك وما کان ربك نسیا﴾ دەسەڵاتی تەواو هەربۆخوایە، چونکە هەرچی ئێستا لەپێشمانە (واتە: ڕۆژی دوایی)، هەرچیش لە دوامانەوە رابووردووە واتە: کاروباری دونیا، وە ئەوەش کە لەونێوانەدایە هەربۆ خوایە، وە پەروەردگاریشت لە بیری نەکردوویت ﴿٦٥ رب السموات والأرض وما بینهما﴾ واتە: راهێنەرو پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەویی وهەرچی لە نێوانیاندا هەیە، ئاگاداری تەواوی بوونەوەرەو هەرئەویشە ئەیانبا بەڕێوە ﴿فاعبدە﴾ کەواتە تۆش بەردەوام هەرئەوبپەرستە ﴿واصطبر لعبادتە﴾ وە بەرامبەر بەئەرکەکانی پەرستنی ئەو زۆر خۆراگر بە. ﴿هل تعلم لە سمیا﴾ ئاخۆ ئاگات لێیە هاو ناوێکی هەبێ؟ دیارە چاك دەزانی، کەبێ وێنەو بێ هاوبەشە.



رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا فَٱعۡبُدۡهُ وَٱصۡطَبِرۡ لِعِبَٰدَتِهِۦۚ
هَلۡ تَعۡلَمُ لَهُۥ سَمِيّٗا ٦٥ وَيَقُولُ ٱلۡإِنسَٰنُ أَءِذَا مَا مِتُّ لَسَوۡفَ
أُخۡرَجُ حَيًّا ٦٦ أَوَلَا يَذۡكُرُ ٱلۡإِنسَٰنُ أَنَّا خَلَقۡنَٰهُ مِن قَبۡلُ
وَلَمۡ يَكُ شَيۡـٔٗا ٦٧ فَوَرَبِّكَ لَنَحۡشُرَنَّهُمۡ وَٱلشَّيَٰطِينَ ثُمَّ
لَنُحۡضِرَنَّهُمۡ حَوۡلَ جَهَنَّمَ جِثِيّٗا ٦٨ ثُمَّ لَنَنزِعَنَّ مِن كُلِّ
شِيعَةٍ أَيُّهُمۡ أَشَدُّ عَلَى ٱلرَّحۡمَٰنِ عِتِيّٗا ٦٩ ثُمَّ لَنَحۡنُ أَعۡلَمُ بِٱلَّذِينَ
هُمۡ أَوۡلَىٰ بِهَا صِلِيّٗا ٧٠ وَإِن مِّنكُمۡ إِلَّا وَارِدُهَاۚ كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ
حَتۡمٗا مَّقۡضِيّٗا ٧١ ثُمَّ نُنَجِّي ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّنَذَرُ ٱلظَّٰلِمِينَ
فِيهَا جِثِيّٗا ٧٢ وَإِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٖ قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ
لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَيُّ ٱلۡفَرِيقَيۡنِ خَيۡرٞ مَّقَامٗا وَأَحۡسَنُ نَدِيّٗا ٧٣ وَكَمۡ
أَهۡلَكۡنَا قَبۡلَهُم مِّن قَرۡنٍ هُمۡ أَحۡسَنُ أَثَٰثٗا وَرِءۡيٗا ٧٤ قُلۡ مَن
كَانَ فِي ٱلضَّلَٰلَةِ فَلۡيَمۡدُدۡ لَهُ ٱلرَّحۡمَٰنُ مَدًّاۚ حَتَّىٰٓ إِذَا رَأَوۡاْ مَا يُوعَدُونَ
إِمَّا ٱلۡعَذَابَ وَإِمَّا ٱلسَّاعَةَ فَسَيَعۡلَمُونَ مَنۡ هُوَ شَرّٞ مَّكَانٗا
وَأَضۡعَفُ جُندٗا ٧٥ وَيَزِيدُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ٱهۡتَدَوۡاْ هُدٗىۗ
وَٱلۡبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ خَيۡرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابٗا وَخَيۡرٞ مَّرَدًّا ٧٦

**زیندووبوونەوە بەسەیرو سەمەرە دەزانن:**

﴿٦٦ ویقول الإنسان أإذا مامت﴾ ئینسانی بێ باوەر و سەرکەش بە سەرسوڕمانێکەوە ئەڵێت: ئایا کاتێ مردم ﴿لسوف أخرج حیا﴾ تەئکیدە لە ئاییندە دابە زیندوویی لە گۆڕ دەهێنرێمە دەرێ؟! ﴿٦٧ أولا یذکر الإنسان﴾ باشە ئاخۆ ئەو ئینسانە بیر ناکاتەوە؟ ﴿إنا خلقناه من قبل﴾ کە ئێمە سەرەتا ئەومان دروستکرد ﴿ولم یك شیئا﴾ هیچیش نەبوو، لە نەبوونەوە هێنامان ﴿٦٨ فوربك لنحشرنهم والشیاطین﴾ سوێند بە پەروەردگارەکەت ئەی موحەممەد ﷺ هەموو ئەوانە لەگەڵ ئەو شەیاتینانەدا ئەمانیان فریودا کۆدەکەینەوە. واتە: پێکەوە حەشریان دەکەین ﴿ثم لنحضرنهم حول جهنم جثیا﴾ لە پاشا دەوران دەور هەموو لە دۆزەخدا بە چۆکدا دێنین و دەیانخەینە ناوی ﴿٦٩ ثم لننزعن من کل شیعة﴾ لەپاشا لەناوهەر کۆمەڵ و تاقمێك کەسانێ دەردەکێشین ﴿أیهم أشد علی الرحمن عتیا﴾ کە لەهەمووان دژی خوای بەخشەر سەرکەشترو سەرسەختر بوون، واتە: بەپێی سەرپێچی و سەرسەختییان، یەك لەدوای یەك ئەیانخەینە ناودۆزەخەوە. ئای لەورۆژە، چ رۆژێکی سەخت و نارەحەتە! ﴿٧٠ ثم لنحن أعلم بالذین هم أولی بها صلیا﴾ لەپاشا هەرخۆمان زۆرچاك ئاگادارترو زاناترین بەوکەسانەی کە بۆسووتان و سزا چێشتن لەناو دۆزەخدا شیاوترن.

**دەبێ هەموو بچنە جەهەننەم:**

﴿٧١ وإن منکم إلا واردها﴾ ئەی خەڵکینە! ئیللا دەبێ هەموو نزیکی ئاگری دۆزەخ ببنەوەو بەسەر پردەکەی (صیراط)دا تێپەڕن, وە بەتەفسیرێکی تر: دەبێ هەموو بەسەر دۆزەخدا تێپەڕن. (سەلەف) لەمانای (ورود)دا کێشە و جیاوازییان هەیە: (ئیبن عەباس) ئەڵێ: بەمانای چوونە ناو دۆزەخەوەیە، واتە: هەردەبێ هەموو بچنەناو دۆزەخەوە، پاشان هەرکەس بۆ جێی شیاو بەخۆی دەنێردرێ, هەندێتر دەڵێن: بەمانای نزیکبوونەوەو تێپەڕ بوونە بەسەر ئەوپردەدا لەسەر پشتی دۆزەخدا ئامادە کراوە، (تەبەریی) ئەمەی دووەمی هەڵبژاردووە. ﴿کان علی ربك حتما مقضیا﴾ ئەمەش بڕیارێکە لەلایەن پەروەردگارتەوەبۆ ئەوەدراوەو براوەتەوە و شتێکی حەتمییە ﴿٧٢ ثم ننجی الذین اتقوا﴾ پاش تێپەڕ بوونی هەموان بەسەر ئاگری دۆزەخدا، ئەوجا ئەوانەی وا پارێزگارو خواناس بوون, لەئاگرەکە رزگاریان ئەکەین ﴿ونذر الظالمین فیها جثیا﴾ و ستەمکارانیش لەناودۆزەخدا دەستە ئەژنۆ دێڵینەوە. تەفسیری (بەیزاویی) ئەڵێت: مەبەست لە (ورود) ئەوەیە کە مەردم لەدۆزەخداهەموو بەچۆکدا دێن، لەپاشان باوەڕداران رزگار ئەبن و، کافرانیش لەوێ دەمێننەوە. ﴿٧٣ وإذا تتلی علیهم آیاتنا بینات﴾ هەر کاتێ نیشانەوئایەتە ئاشکرا کانی ئێمە بەسەربێباوەڕاندا بخوێنرێنەوە، ﴿قال الذین کفروا للذین آمنوا﴾ خوانەناس و بێ باوەڕان بە خاوەن بڕواکان دەڵێن: ﴿أی الفریقین خیر مقاما وأحسن ندیا﴾ باشەئێستا لە دنیادا کام لەو دووگرووپە (ئێمە، یان ئێوە) ماڵو جێ وشوێنی خۆشترو باشترو وعەیش ونۆش بۆ لواوترە؟ هەربەو شێوەیەش لەئاخیرەتدا کەئێوە دەڵێن هەیە بەشی ئێمە لەئێوە باشتر دەبێ، واتە: ئێوە بەو لاتی و بێ دەسەڵاتیەوە، خۆتان بە هەق وراست ئەزانن و، ئیمەش بەو سەروەت وسامانەوە بە ناهەق و هیچ وپووچ!!دیارە بڕیاری وا نارەوایە ﴿٧٤ وکم أهلکنا قبلهم من قرن﴾ زۆریشمان لەگەلانی نالەباری پێش ئەوان لەناوبردن ﴿هم أحسن أثاثا ورئیا﴾ کە لەوانە کەل و پەلی ناوماڵ و داراییان زۆرترو رێکترو، بە سیماورەنگ و دیمەن و رووخسار لەمان جوانتر بوون، کەچی هیچ کەڵکێکی نەبوو بۆیان، خوایگەورە هەر لەبارەی رەخنەگرتنیانەوە لە ئیماندارەکان, لە جێگایەکی تردا ئەفەرموێ: (وقال الذین کفروا للذین آمنوا لو کان خیرا ما سبقونا إلیه.. /٤٦/١١), وە هەروەها گەلەکەی (نووح)یش لە بارەی بەکەم تەماشاکردنی موسڵمانە

شوێنکەوتووەکانی نووح ئەیان وت: (أنؤمن لك واتبعك الأرذلون /٢٦/١١١). وە لە جێیەکی دیکەدا- سەبارەت بە تاقیکردنەوەی مرۆڤ بە یەکتر – خوا دەفەرموێ: (وكذلك فتنا بعضهم ببعض ليقولوا أهؤلاء من الله عليهم من بيننا../ ٦/٥٣).

## مرۆڤی گومڕا، خوا پەتی بۆ شل دەکا:

﴿[٧٥] قل من كان في الضلالة﴾ ئەی پێغەمبەرﷺ بەوانەی پێیان وایە ئێوە گومڕان وخۆیان ڕاستن, بڵێ: کەسێك کەلە گومڕاییدا بژی ﴿فليمدد له الرحمن مدا﴾ با خوای بەخشندە تەمەنی درێژ ومالْ وسامانی پێببەخشێ ﴿حتى إذا رأوا ما يوعدون﴾ تائەوکاتە ئەوهەڕەشانە دەبینن بەڵێنیان پێدراوە ﴿إما العذاب وإما الساعة﴾ ئەوسا یان هەرلە دونیادا سزا وئازار دەبینن, یان قیامەت بەرپادەبێو بە تۆلەی خۆیان دەگەن ﴿فستعلمون من هو شر مكانا واضعف جندا﴾ جائێوەش ئەوکاتە – کە ڕاستییەکان دەرکەوتن – چاك ئەزانن چ کەسێ جێ و شوێنی خراپ ناخۆشترەو، چ کەسێش سوپاولەشکری بێدەسەڵاتر ولاوازترە: (ئێوە, یان ئەوان)؟ ﴿[٧٦] و يزيدالله الذين اهتدوا هدى﴾ ئەو کەسانەش خوا ڕێنمایی کردوون بۆریگەی سەرفرازی و بەختیاریی، زیاتر ڕێنوێنیان ئەکا ﴿والباقيات الصالحات خير عند ربك ثوابا﴾ خوای پەروەردگاریشت, لە دوا ڕۆژداپاداشی چاکترو باشتری لایە،بۆ ئەو گوتارو ڕەفتارەچاکانەی هەر دەمێننەوە, وەدەشیانکاتە زەخیرە بۆخاوەنەکانیان ﴿وخير مردا﴾ وە سەرەنجامیشی چاکترو باشترە ,چونکە دونیا هەموو تیا دەچێ و پاشە ڕۆژیش هەرئەمێنێتەوە، موشریکان پێیان وابوو کەئەوان لە شوینکەوتووانی موحەممەد ﷺ چاکترن، چونکە خاوەن سامان و خاوەن دەسەڵاتن!، پێشەوەا (بوخاریی و، پێشەوا موسلیم) دەگێڕنەوە: (خەبابی کوری ئەرەت) دەڵێت: کاری ئاسنگەریم دەکرد، لەئەنجامدا پارەیەکم کەوتە لای (عاصی کوری وائیل) و داوام لیکردو وتی: تا لەموحەممەد ﷺ واز نەهێنی ناتدەمەوە! منیش وتم: سوێند بەخوا قەت وازی لێناهێنم، تا تۆ ئەمری و پاشان زیندوو ئەکرێیتەوە، (عاص) وتی: جائەگەر زیندوو کرامەوەو, تۆش هاتی بۆلام, لەویش من هەرمالْ وسامانم هەیەو ئەتدەمەوە! ئینجا خوا فەرمووی: ﴿[٧٧] افرايت الذى كفر بآياتنا﴾ ئایا ئەو کەسانەت دیت کەئینکاری ئایەتەکانی ئێمەیان دەکرد﴿وقال لأوتين مالا وولدا﴾ گوتیشی: بێگومانم کە لەدواڕۆژیشدا من مالْ وسامان و منداڵێکی زۆرم ئەدرێتی؟! ﴿[٧٨] اطلع الغيب ام اتخذ عند الرحمن عهدا﴾ ئاخۆ ئەو بەندە لاسارەیە لەکارە نادیارو نهێنییەکانی خوا بەئاگاو زانایە، یان لەلای خوای بەخشندەوە بەڵێن و پەیمانێکی وەرگرتووە, وا بەخۆڕایی ئەو قسانە دەکاو بەتەمای خێرو خۆشیی ئەولایە؟!! ﴿[٧٩] كلا سنكتب ما يقول﴾ نەخێر، قەت وا نییە ئەوئەیزانێت، دەبا واز لەوقسانە بێنێ، چونکە بێگومان

الجزء السادس عشر — سورة مريم

أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى كَفَرَ بِـَٔايَـٰتِنَا وَقَالَ لَأُوتَيَنَّ مَالًا وَوَلَدًا ﴿٧٧﴾ أَطَّلَعَ ٱلْغَيْبَ أَمِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحْمَـٰنِ عَهْدًا ﴿٧٨﴾ كَلَّا ۚ سَنَكْتُبُ مَا يَقُولُ وَنَمُدُّ لَهُۥ مِنَ ٱلْعَذَابِ مَدًّا ﴿٧٩﴾ وَنَرِثُهُۥ مَا يَقُولُ وَيَأْتِينَا فَرْدًا ﴿٨٠﴾ وَٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ ءَالِهَةً لِّيَكُونُوا۟ لَهُمْ عِزًّا ﴿٨١﴾ كَلَّا ۚ سَيَكْفُرُونَ بِعِبَادَتِهِمْ وَيَكُونُونَ عَلَيْهِمْ ضِدًّا ﴿٨٢﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّآ أَرْسَلْنَا ٱلشَّيَـٰطِينَ عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ تَؤُزُّهُمْ أَزًّا ﴿٨٣﴾ فَلَا تَعْجَلْ عَلَيْهِمْ ۖ إِنَّمَا نَعُدُّ لَهُمْ عَدًّا ﴿٨٤﴾ يَوْمَ نَحْشُرُ ٱلْمُتَّقِينَ إِلَى ٱلرَّحْمَـٰنِ وَفْدًا ﴿٨٥﴾ وَنَسُوقُ ٱلْمُجْرِمِينَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ وِرْدًا ﴿٨٦﴾ لَّا يَمْلِكُونَ ٱلشَّفَـٰعَةَ إِلَّا مَنِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحْمَـٰنِ عَهْدًا ﴿٨٧﴾ وَقَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحْمَـٰنُ وَلَدًا ﴿٨٨﴾ لَّقَدْ جِئْتُمْ شَيْـًٔا إِدًّا ﴿٨٩﴾ تَكَادُ ٱلسَّمَـٰوَٰتُ يَتَفَطَّرْنَ مِنْهُ وَتَنشَقُّ ٱلْأَرْضُ وَتَخِرُّ ٱلْجِبَالُ هَدًّا ﴿٩٠﴾ أَن دَعَوْا۟ لِلرَّحْمَـٰنِ وَلَدًا ﴿٩١﴾ وَمَا يَنۢبَغِى لِلرَّحْمَـٰنِ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا ﴿٩٢﴾ إِن كُلُّ مَن فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ إِلَّآ ءَاتِى ٱلرَّحْمَـٰنِ عَبْدًا ﴿٩٣﴾ لَّقَدْ أَحْصَىٰهُمْ وَعَدَّهُمْ عَدًّا ﴿٩٤﴾ وَكُلُّهُمْ ءَاتِيهِ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ فَرْدًا ﴿٩٥﴾

٣١١

ئەو هەرچی بڵێ، ئێمە بەزوویی ئەینووسین. تێبینی: (قورتوبیی) ئەڵێ: بەشی یەکەمی نیوەی قورئانی پیرۆز، بێژەی (کلا)ی تێدا نییە. (ئالووسیی) ئەڵێ: لەبەشی نیوەی کۆتایی قورئاندا (٣٣) بێژەی (کلا)هاتووە﴿ونمد له من العذاب مدا﴾ وە بەهۆی درۆکەیشیەوە ماوەی جەزرەبەو سزاکەشی بۆدرێژ ئەکەینەوە ﴿٨٠ ونرثه ما يقول﴾ وەهەرچیش بڵێ ،ئێمە دەبینە خاوەنیو لای خۆمان دەمێنێتەوە ﴿ويأتينا فردا﴾ و ئەویش بۆ خۆی بەتاك وتەنیاو دەستی خاڵی، دێتە لامان بۆ لێپرسینەوە.

**پەرستراوەکان حاشا لە پەرستیارەکانیان دەکەن:**

﴿٨١ واتخذوا من دون الله آلهة﴾ ئەو بێ باوەڕانە لەباتی خوای بەدەسەڵات چەند شتێکی تریان بۆخۆیان هەڵبژاردوو بەخوایان دانان!﴿ليكونوا لهم عزا﴾ تا بەخەیاڵی خۆیان ببنە تکاکارو دۆست وپشتیوان بۆیان ﴿٨٢ كلا سيكفرون بعبادتهم﴾ قەت وانییە وەك ئەوان ئەیزانن، چونکە لەرۆژی خۆیدا گشت پەرستراوەکانیان ئینکاری پەرستنیان ئەکەن ویەخەیان لێهەڵئەتەکێنن وبڕوایان بەپەرستنیان نیە ﴿ويكونون عليهم ضدا﴾ و بەسەختیش ئەبنە دژیان، واتە: پەرستن و شوێنکەوتنی مرۆڤ وپەریی و ئادەمیی، هیچ کەڵکیك بە پەرستیارەکە نابەخشێ. جگە لەوەیش کە لەپاشەرۆژدا هەردووکیان دەبنە دژی یەکترو سووتەمەنی دۆزەخ، وەك لەجێگایەکیتردا هەر سەبارەت بەوە ئەفەرموێ: (وإذا حشر الناس كانوا لهم أعداء وكانوا بعبادتهم كافرين). ﴿٨٣ ألم تر أنا أرسلنا الشياطين على الكافرين﴾ ئایا تۆ نەتزانیوە کەئێمە شەیاتینەکانمان ناردۆتە سەرکافرو بێبڕوایان ﴿تؤزهم أزا﴾ هانیان ئەدەن بۆگوناح وتاوان، واتە: ئاوات وڕێگەی پووچەڵیان دەخەنە بەر، وەك ئەم ئایەتەش دەفەرموێ: (ومن يعش عن ذكر الرحمن نقيض له شيطانا فهو له قرين) کە ئەمیش هەرئەو ماناومەبەستە دەگەیەنێ. ﴿٨٤ فلا تعجل عليهم﴾ جاتۆیش ئەی موحەممەد ﷺ هیچ پەلەیەکیان لێمەکە بۆ لەناوچوونیانو، خۆتیش بێ تاقەت مەکە ﴿إنما نعد لهم عدا﴾ چونکە ئێمە کردەوەو گوناحەکانیان ئەژمێرین بە ئەژماردن، واتە: لە رۆژی قیامەتدا حیسابیان لە گەڵ دەکەین ،جا ئێستا چی دەکەنبابیکەن، ئەم ئایەتانەش لەو بارەوە دەفەرموون: (فمهل الكافرين أمهلهم رويدا).(إنما نملي لهم ليزدادوا إثما) یان (نمتعهم قليلا ثم نضطرهم الى عذاب غليظ)، یان (قل تمتعوا فإن مصيركم النار).

**پارێزکاران و تاوانباران:**

﴿٨٥ يوم نحشر المتقين إلى الرحمن وفدا﴾ ئەی پێغەمبەر! باسی ئەورۆژە بکە کەئێمە دەستەدەستە خۆپارێزەکان بەرێزو حورمەتەوە دەبەینە دیداری خوای بەخشندە بۆ پاداش، بەرێزو بەسواریی، هەروەکو چۆن پێشوازی لە وەفدێ دەکرێ، (جەوهەریی) ئەڵێ: (وفد فلان على الأمير، أي ورد رسولا فهو وافد، والجمع وفد مثل صاحب و صحب). ﴿٨٦ ونسوق المجرمين إلى جهنم وردا﴾ گوناهەکاران وتاوانبارانیش بەپێ و بەتینوویەتی بەرەو دۆزەخ راو دەنێن و لێ ئەخوڕین وەکو گاگەل بۆ ئاوەخۆرە ملدەنێن ﴿٨٧ لا يملكون الشفاعة﴾ دەسەڵاتی تکاکردنیان نییەو تکاولاڵەشیان لێوەرناگیرێ ﴿إلا من اتخذ عند الرحمن عهدا﴾ مەگەر کەسێك لای خوای گەورە بەڵێن و پەیمانی ساندبێ، واتە: کردەوەی چاکی بۆخۆی کردبێت، ئەوسا دەسەڵاتی شەفاعەتی دەبێ.

**دەڵێن خوا فەرزەندی هەیە:**

﴿٨٨ وقالوا اتخذ الرحمن ولدا﴾ جوولەکەو گاورو بت پەرستەکان گوتوشیانە: خوا بۆخۆی منداڵی هەیە!! ﴿٨٩ لقد جئتم شيئا إدا﴾ ئای بە راستیی قسەیەکی زۆر رەقو گەورەو دزیوو خراپتان بەدەمدا هاتووە! (جەوهەریی) ئەڵێ: (الإدُّ والإدّةُ: الداهية والأمر الفظيع).﴿٩٠ تكاد السموات يتفطرن منه﴾ لەبەر ئەو قسە ناقولایە نزیکە

ئاسمانەکان لەیەك بترازین ولەت وپەت ببن ﴿وتنشق الأرض﴾ زەویش قاژقاژ ببێ ﴿وتخر الجبال هدا﴾ و کێوەکانیش بەهارەهارپروخێن وبەیەکا بچن وبکەون (جەوهەریی) ئەڵێ: (هد البناء یهده هدا، کسره وضعفه) وە لەفەرموودەیشدا هاتوو: (اللهم إني أعوذ بك من الهد والهدة) خوایا! لەقسەو کردەوەی خراپ و درێوو لاواز، پەنا هەر بەتۆ دەبەم، أبوداود. ﴿[٩١] أن دعوا للرحمن ولدا﴾ لەبەرئەوە کەگوتیان خوای بەخشەر منداڵی هەیە ﴿[٩٢] وما ینبغی للرحمن ان یتخذ ولدا﴾ خۆ هەرگیز لەخوای میهرەبانیش ناوەشێتەوە منداڵ بۆخۆی دابنێ، چونکە ئەر وابێ ئەوکاتە ئەویش دەبێ وەك مرۆکان بێ و تازە پەیدابووبێ! بەڵێ.. زەنگ و دەنگی ئەم وشانە بەوشێوە زۆر رەق وتوندە، خەشم وقینی خوایگەورە نیشان ئەدات بەرامبەر بەوکەسانە شەریك وهاوبەشی بۆبریار ئەدەن. ﴿[٩٣] إن کل من فی السموات والأرض﴾ بەراستیی هەرچی لەناو ئاسمانەکان وزەویدایە ﴿إلا آتی الرحمن عبدا﴾ سەرجەم هەموو بە بەندێتی و خوڵامەتی دێنە لای پەروەردگاری بەخشەر و وملکەچی دەبن ﴿[٩٤] لقد احصاهم وعدهم عدا﴾ بەراستیی زۆر بەوردی سەرحیسابی هەموویانەو هەر بەهەژمار سەر ژمێری کردوون وهەرچیشیان کردووە چاك ئەیزانێ ﴿[٩٥] وکلهم آتیه یوم القیامة فردا﴾ و هەر هەموویشیان رۆژی قیامەت بە تاك و تەنیایی و دوور لە هەموو دەسەڵاتیك" دێنەلای خوا.

### باوەڕداران خۆشەویستن:

﴿[٩٦] إن الذین آمنوا وعملوا الصالحات﴾ بە راستیی ئەوانەی باوەڕیان هێناو کردەوە چاکەکانیان ئەنجامدا ﴿سیجعل لهم الرحمن ودا﴾ بێسۆ خوای میهرەبان دەیانکاتە خۆشەویست و، خۆشەویستییان دەخاتە دڵی بەندەکانی خۆیەوە تا گشت خۆشیان بوێن. پێشەوا (بوخاریی) و، پێشەوا(ئەحمەد) لە(ئەبو هورەیرە)وە دەگێڕنەوە کەپەیامبەر ﷺ دەفەرموێ: هەرکەخوا بەندەیەکی خۆشویست (جبریل) تێدەگەیەنێت: وا من فلانم خۆش ئەوێت، تۆش خۆشت بوێت، ئەوجا جوبرەئیلیش خۆشی دەوێت. پاشان ئەویش بەناو دانیشتوانی ئاسماندا جاڕ دەدات کە: خوای میهرەبان فلانە کەسی خۆش دەوێ، ئێوەیش خۆشتان بوێت، ئەوسا گشت ئەوایش خۆشیان دەوێ. پاشان بەوبۆنەوە لەزەویشدا پلەی بەرزو خۆشەویستی وەردەگرێ وڕێزی بۆدادەنرێ. خۆهەر کاتێکیش خوا بەندەیەکی خۆشنەویست و ڕقی لێبوویەوە بەجوبریل دەفەرموێ: من فلانم خۆشناوێ، دەبێ تۆیش خۆشت نەوێ، ئیتر ئەویش ڕقی لێهەڵدەگرێ.. لەپاشان خەڵکی ئاسمانەکان ئاگادار ئەکرێن کەخوا ڕقی لەفلانە کەسە، دەبێ ئێوەش ڕقی لێ هەڵگرن، ئینجا ئەوانیش ڕقی لێهەڵدەگرن. پاشان لەزەوییشدا پلەی بێڕێزی وبێ حورمەتی بۆدادەنرێ ﴿[٩٧] فإنما یسرناه بلسانك﴾ بۆیە ئێمە خوێندنی ئەم قورئانەمان لەسەر زمانی تۆ ئاسان کرد، کە بەئاسانی دەیخوێنیتەوە ﴿لتبشر به المتقین﴾ تا بەوقورئانە موژدە بەخواناس وپارێزکاران بدەی بەرەزامەندی و خۆشنوودی خوا ﴿وتنذر به قوما لدا﴾ و گەلی دوژمن وسەرسەخت ودڵڕەقیشی پێ بترسێنی لەئەنجامی کارە شوومەکانیان (اللد: جمع اللد، وهو الشدید الخصومة). ﴿[٩٨] وکم اهلکنا قبلهم من قرن﴾ وە خەڵکی زۆرمان لەپێش ئەمانیشەوە –بەهۆی سەرپێچییانەوە– تیا بردو قڕ تێخست ﴿هل تحس منهم من احد﴾ ئاخۆ ئێستا هەست بەهیچ کەسێکیان ئەکەیت؟! ﴿او تسمع لهم رکزا﴾ وەیان سرتەو نووزەیان لێدەبیسی؟! واتە: کەئەوانە سەرپێچییان کرد، ئێمەیش بەشێوەیەك لە ڕیشەمان هێنان، دەڵێیت هەرنەبوون ورۆژێك نەژیاون.

هەم هەوەڵ و، هەم ئاخر گەلێ سوپاسی خوای پەروەردگار دەکەم کە یارمەتیدام بۆ تەواو کردنی سوورەتی (مەریەم).

## ٢٠- سوورەتی ( تاها )ـە

## مەککەییەو ( ١٣٥ ) ئایەتە

### بەناوی خوای بەبەزەیی و میهرەبان

ئەم سوورەتە وەك سوورەتە مەککەییەکانی تر، باسی بناغە سەرەکییەکانی ئایین دەکات: یەکخواپەرستیی، پەیامبەریێتی، زیندوو بوونەوە، لەم سوورەتەدا کەسێتی پەیامبەر ﷺ دەردەکەوێ کە: چەندە خۆراگرو، دڵ ئەستوور بووە.. هەروەها داستانی هەندێ پەیامبەرانی تریش باس دەکات.. ئەوسا بەسەرپێیی و بەپەلەیەکەوە دیمەنێکی سەختی رۆژی قیامەت دەردەخات، لەگەڵ باس کردنی داستان و چیرۆکی (ئادەم) پەیامبەردا عليه السلام..

(تاها)یش لەپیتە بچربچڕەکانە کە لەسەرەتای هەندێ سوورەتەوەن، هاتوون بۆ دەسەوسان کردنی عەرەبەکان، لەهێنانی تەنها بەشێك وەك قورئان، ئەگەرچی زۆرکەمیش بێت.

### قورئان پەندەو لای خواوە هاتووە:

﴿بسم الله الرحمن الرحيم * ١ طه * ٢ ما انزلنا عليك القرآن لتشقى﴾ ئەی پێغەمبەر! ئەم قورئانەمان بۆ نەناردویت ئەوەندە خۆت ماندوو و شەکەت بکەیت, بەڵێ.. کاتێ ئەم قورئانە هاتە خوارێ، پەیامبەر ﷺ هەم خۆیی و، هەم هاوەڵانی درێژەیان بە نوێژو شەونوێژ دەداو زۆریش ماندوو دەبوون، هەتا خوای دلۆڤان ئەو ئایەتەی ناردو فەرمووی: ﴿٣ إلا تذكرة لمن يخشى﴾ هەر بۆئەوە ناردوومانە ببێتە ئامۆژگاریی و بیرخەرەوەی رۆژی پەسڵان بۆ ئەوکەسەی لەخوا دەترسێ ﴿٤ تنزيلا ممن خلق الأرض والسموات العلى﴾ لەلایەن ئەو خواوە نێرراوە کە زەویی و ئاسمانە بەرزەکانی دروستکردووە ﴿٥ الرحمن على العرش استوى﴾ ئەو خوا بەخشندەیە چوویە سەر عەرشی خۆی، بەڵێ.. مەبەست بەم چوون و سەرکەوتنەیە بۆسەر عەرش، سەرکەوتنێکە شیاوی زاتی بڵندی ئەو بێ،و، بەوشێوەیە کە(سەلەف)و پێشینانمان تەفسیریان کردووەو، بێ هیچ شوبهاندن و لێکدانەوەو چوونە ناو قولاییەوە، جابۆزیاتر بەئاگابوون لەم چوونە سەر عەرشە، سەیری سوورەتەکانی: (ئەعراف) و (یونس) و (رەعد) بکە. ﴿٦ له مافى السموات وما فى الأرض و ما بينهما و ما تحت الثرى﴾ هەرچی لەئاسمانەکان و، هەرچیش لە زەوییدایەو، هەرشتێکیش لەنێوانیاندایە و، ئەوەش لەنێو خاکدایەو پەنهانە, هەرهەموو موڵکی ئەوە، وەك لەسوورەتی (فورقان)یشدا ئەفەرموێ: (قل أنزله الذي يعلم السر في السموات والأرض إنه كان غفورا رحيما). ﴿٧ و إن تجهر بالقول فإنه يعلم السر واخفى﴾ وە ئەگەر تۆ بەئاشکرا قسە بکەیت و دەنگ هەڵبڕی، وەیان بەهێواش و هێدی تریش، لای خوا یەکسانە، چونکە ئەوئاگای لەنهێنی نێوان خەڵك و ئەوەیش مرۆ لەدڵی خۆیدا پەنهانی دەکا هەیە



إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَيَجْعَلُ لَهُمُ
الرَّحْمَٰنُ وُدًّا (٩٦) فَإِنَّمَا يَسَّرْنَاهُ بِلِسَانِكَ لِتُبَشِّرَ بِهِ
الْمُتَّقِينَ وَتُنذِرَ بِهِ قَوْمًا لُّدًّا (٩٧) وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم
مِّن قَرْنٍ هَلْ تُحِسُّ مِنْهُم مِّنْ أَحَدٍ أَوْ تَسْمَعُ لَهُمْ رِكْزًا (٩٨)

سُورَةُ طه — ترتيبها ٢٠ — آياتها ١٣٥

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
طه (١) مَا أَنزَلْنَا عَلَيْكَ الْقُرْآنَ لِتَشْقَىٰ (٢) إِلَّا تَذْكِرَةً — الحزب ٣٢
لِّمَن يَخْشَىٰ (٣) تَنزِيلًا مِّمَّنْ خَلَقَ الْأَرْضَ وَالسَّمَاوَاتِ الْعُلَى (٤)
الرَّحْمَٰنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَىٰ (٥) لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي
الْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَمَا تَحْتَ الثَّرَىٰ (٦) وَإِن تَجْهَرْ بِالْقَوْلِ
فَإِنَّهُ يَعْلَمُ السِّرَّ وَأَخْفَى (٧) اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ لَهُ الْأَسْمَاءُ
الْحُسْنَىٰ (٨) وَهَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ مُوسَىٰ (٩) إِذْ رَأَىٰ نَارًا
فَقَالَ لِأَهْلِهِ امْكُثُوا إِنِّي آنَسْتُ نَارًا لَّعَلِّي آتِيكُم مِّنْهَا بِقَبَسٍ
أَوْ أَجِدُ عَلَى النَّارِ هُدًى (١٠) فَلَمَّا أَتَاهَا نُودِيَ يَا مُوسَىٰ (١١)
إِنِّي أَنَا رَبُّكَ فَاخْلَعْ نَعْلَيْكَ إِنَّكَ بِالْوَادِ الْمُقَدَّسِ طُوًى (١٢)

﴿^٨ الله لاإله إلاهو﴾ زاتێکه بێجگه له خۆی هیچ پەرستراوێك نیه شیاوی پەرستن بێت ﴿له الأسماء الحسنى﴾ گشت ناوه جوانەکان, هەرهی ئەون, پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((إن لله تسعةً وتسعينَ إسماً مَنْ أحْصاها دَخَلَ الجَنَّةَ)) ترمزیی. واته: خوا نەوەت و نۆ ناوی هەیه، هەرکەسێ بیانخوێنێ و لەبەریانکاو کاریشیان پێبکا، ئەوا دەچێته بەهەشتەوه، بەڵێ ئەم باسەی ناوه جوانەکانی خوایه، لەئایەتی: (١٨٠) سوورەتی (ئەعراف) و سوورەتی (حەشر)دا پتر روون کراوەتەوه، بۆ زیاتر بەئاگابوون بگەڕێوه ئەوێ.

## چیرۆکی پەیامەکەی مووسا ﷺ:

ئینجا داستانەکەی مووساو سەرەتای دەستپێکردنی سروش و وتووێژی ئەو لەگەڵ پەروەردگاری خۆیدا دەستپێدەکاو دەفەرموێ: ﴿^٩ وهل اتاك حديث موسى﴾ ئاخۆ ئەی پێغەمبەر!ﷺ هەواڵ و بەسەرهاتی مووسات بۆهاتووه؟ ﴿^١٠ إذ رأى نارا فقال لأهله امكثوا﴾ کاتێ لەو سەفەرەیدا هەر له دوورەوه لەچۆڵی (سینا)دا ئاگر (نوور)ێکی چاوکردو ئەوسا بەژن و ماڵەکەی خۆیی وت: ئێوه لێره بن و مەبزوون ﴿إني آنست نارا﴾ بەڕاستیی من ئاگرێکم چاو کردووه ﴿لعلى آتيكم منها بقبس﴾ بەشکوم لەوێ چڵۆسك و سەلکه بزووتێکتان بۆبێنم خۆتانی پێ گەرم بکەنەوه، خوا لەجێیەکی تردا بەزمانی مووساوه د ەفەرموێ: (..أو جذوة من النار..)٢٩/٢٨. ﴿او اجد على النار هدى﴾ و یان چاوساغێکم بۆ شارەزایی دەستکەوێ و به هۆی ئەوەوه ڕێگا دەرکەین، ڕاڤەکەرانی قورئان دەڵێن: گەڕانەوەی مووسا بۆ وڵاتی میسر پاش تەواوکردنی (١٠) ساڵەکەی لای (شوعەیب) بوو، جا دەبێ پاش ئەو ئەمنیەت و ئاسایشه لەلای شوعەیب دەستی کەوتبوو, بۆچی ئێستا جارێکیتر بگەڕێتەوه بۆ وڵاتێك، که کاتی خۆی لێی هەڵهاتبێت؟! دیاره بەدەر لەکاره نهێنییەکانی خوا، سۆزی وڵات و نیشتمان لەگەڵێ شت بەهێزترەو، هەرگیزیش لەبیرناچێ، ئەگەرچی ڕێگاکەیشی پڕبێت لەدەیان هەڵدێرو مەترسی، جا لەڕێگەی گەڕانەوەیدا خوا منداڵێکیان پێدەدا، کاتەکەیشی زۆر سەرما دەبێ، هەرچەنده له چەخماخ دەدا، ئاگر ناگرێت! بەڵام له دوورەوه ئەو ئاگرەی چاوکرد، بۆ زیاتر ئاگاداری سەیرێکی تەفسیری (ئیبن کەسیر) بکه.

## سەرەتای وەحیی بۆ مووسا ﷺ:

﴿^١١ فلما اتاها نودي يا موسى﴾ ئینجا که نزیکبووەو هاتەلای نوورەکه، دیتی وا لەناو درەختێکی زۆر جوان و تەڕدا ئاگرێك دەدرەوشێتەوه، ئەوجا لەوێدا بانگی لێکرا ئەی مووسا! ﴿^١٢ إني انا ربك فاخلع نعليك﴾ بێگومان من پەروەردگاری تۆم، جا تۆیش لەبەر ئەدەب و وێڵی جێگاکه پێڵاوو شەکالەکەت لەپێداکەنه ﴿إنك بالواد المقدس طوى﴾ چونکه بەڕاستیی تۆ وای له دۆڵی پیرۆزی (طوا)دا، له ئایەتیتردا دەفەرموێ: (فلما أتاها نودي من شاطئ الواد الأيمن في البقعة المباركة من الشجرة أن يا موسى إني أنا الله..)٣٠/٢٨. وه یان دەفەرموێ: (إذ ناداه ربه بالوادي المقدس طوى)١٦/٨٩. ﴿^١٣ وانا اخترتك فاستمع لما يوحى﴾ من بۆ خۆم تۆم لەنێو هۆزەکەت دا بەپەیامبەریی دەست نیشان کردو هەڵبژارد, جاکەوایه چاك گوێدێری ئەو فەرمایشتانه به لەڕێگای وەحیەوه بۆت دێت ﴿^١٤ إنني انا الله﴾ بێگومان هەر منم خوا (الله) ﴿لا إله إلا انا﴾ من نەبێ هیچ پەرستراوێکی هەق نیه ﴿فاعبدني﴾ دەسا تۆش بەشێوەیەکی جوان بم بپەرسته ﴿واقم الصلاة لذكرى﴾ وه بۆئەوه که منت هەر لەیادبێ و لەبیرم نەکەیت، به تێروتەسەلی نوێژ بکەو، ڕوویشت هەر لەمن بکه ﴿^١٥ إن الساعة آتية﴾ دیارەکه بەیەقین ڕۆژی قیامەت وابەڕێوەو هەردێت ﴿اكاد أخفيها﴾ (قەتادە) ئەڵێ: واته: من دەمەوێ تەنانەتی لەخۆشمی بشارمەوه، چ جای لەفریشتەو لەپێغەمبەرانیش، واته: جارێ بۆ هیچ کەسێك ئاشکرا نەبێت. (ئیبن عەباس) ئەڵێ: بێجگه لەخۆم

کەسێکی لێ بەئاگا ناکەم. (سدی) دەڵێ: لەئاسمان و لەزەوییدا هیچ کەسێ نیە کە خوا کاتی هاتنی قیامەتی لێ نەشاردبێتەوە. ﴿لتجزی کل نفس بما تسعی﴾ ئەو ڕۆژە دێ، هەتا هەمووکەسێ لە بەرامبەر هەوڵ و تێکۆشانی خۆیەوە پاداش و تۆڵەی دەسکەوێ ﴿[16] فلا یصدنك عنها من لا یؤمن بها واتبع هواه فتردی﴾ جا ئەی موسا! ئەوکەسەی بڕوای بەهاتنی نیەو شوێنی هەواو ئارەزووی خۆی کەوتووە، وریابە با ڕێگریت نەکا لەبڕوا پێبوونی، ئەوسا تیا بچیت.

## عەساکەی مووسا ﷺ دەبێتە ئەژدەها:

﴿[17] وما تلك بیمینك یا موسی﴾ جا خوا فەرمووی موسا! ئەی ئەمە چییە کەبەدەستی ڕاستتەوەیە؟ ﴿[18] قال هی عصای اتوکأ علیها﴾ موسا وتی: ئەوە گۆچانەکەمە، لەکاتی ڕۆشتندا دەیگرم بەدەستەوەو، وە بەرپشتی خۆشمی دەدەم ﴿واهش بها علی غنمی﴾ و گەڵای دارانی پێ ئەوەرێنم بۆ پەزو مەڕەکانم ﴿ولی فیهامآرب اخری﴾ و چەند کاری تریشی پێ ئەنجام دەدەم نان و تفاقی پێهەڵدەگرم، دوڕندەی پێئەکوژم..هتد بەڵێ.. کەڵکی (عەسا) گرتن بەدەستەوە زۆرەو لەشەریعەتیشدا بنەڕەتێکی هەیە، پێغەمبەریش ﷺ وەك ئیمامی بوخاریی ئەڵێ: لە دەشت و چۆڵەوانیدا ئەیکردە نیشانەی رووگەی نوێژو لەبەردەمی خۆیدا دایدەچەقان، وە لەڕۆژی جەژنیشدا لە نوێژگاکەیدا دایدەچەقان، کاتێکیش گەیشتبا لای بەردە ڕەشەکە ئەگەر دەرفەت نەبووبا ماچی بکا بە عەساکەی ئاماژەی بۆ دەکرد. زانایان یەکدەنگن کە عەسا بەدەستەوە گرتن لەکاتی وتاری هەینیدا سوننەتە، دەشتوانی بۆئەم مەبەستە سەیرێکی تەفسیری قورتوبی بکەیت تا زیاتر بەئاگابی ﴿[19] قال القها یا موسی﴾ خوا فەرمووی: موسا! دە ئەو عەسایە بهاوێژە! ﴿[20] فألقاها فإذا هی حیة تسعی﴾ هەرکە فڕێیدا کتوپڕ دیتی وا مارێکی گەورەیەو دەجولێت و دەشڵەژێ، موساش هەرکە ئەوەی دیت کەوتە شڵەژان و ترسان ﴿[21] قال خذها ولا تخف﴾ خوا فەرمووی: بیگرەو ترست نەبێ ﴿سنعیدها سیرتها الأولی﴾ هەر ئێستاکە وەك ئەوسای خۆی لێ ئەکەینەوەو دەبێتەوە عەساکەی جارانت.

سُورَةُ طه — الجزء السادس عشر

وَأَنَا اخْتَرْتُكَ فَاسْتَمِعْ لِمَا يُوحَىٰ ﴿١٣﴾ إِنَّنِي أَنَا اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا أَنَا
فَاعْبُدْنِي وَأَقِمِ الصَّلَاةَ لِذِكْرِي ﴿١٤﴾ إِنَّ السَّاعَةَ آتِيَةٌ
أَكَادُ أُخْفِيهَا لِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍ بِمَا تَسْعَىٰ ﴿١٥﴾ فَلَا يَصُدَّنَّكَ
عَنْهَا مَنْ لَا يُؤْمِنُ بِهَا وَاتَّبَعَ هَوَاهُ فَتَرْدَىٰ ﴿١٦﴾ وَمَا تِلْكَ
بِيَمِينِكَ يَا مُوسَىٰ ﴿١٧﴾ قَالَ هِيَ عَصَايَ أَتَوَكَّأُ عَلَيْهَا
وَأَهُشُّ بِهَا عَلَىٰ غَنَمِي وَلِيَ فِيهَا مَآرِبُ أُخْرَىٰ ﴿١٨﴾ قَالَ أَلْقِهَا
يَا مُوسَىٰ ﴿١٩﴾ فَأَلْقَاهَا فَإِذَا هِيَ حَيَّةٌ تَسْعَىٰ ﴿٢٠﴾ قَالَ خُذْهَا
وَلَا تَخَفْ سَنُعِيدُهَا سِيرَتَهَا الْأُولَىٰ ﴿٢١﴾ وَاضْمُمْ يَدَكَ
إِلَىٰ جَنَاحِكَ تَخْرُجْ بَيْضَاءَ مِنْ غَيْرِ سُوءٍ آيَةً أُخْرَىٰ ﴿٢٢﴾ لِنُرِيَكَ
مِنْ آيَاتِنَا الْكُبْرَىٰ ﴿٢٣﴾ اذْهَبْ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُ طَغَىٰ ﴿٢٤﴾ قَالَ
رَبِّ اشْرَحْ لِي صَدْرِي ﴿٢٥﴾ وَيَسِّرْ لِي أَمْرِي ﴿٢٦﴾ وَاحْلُلْ عُقْدَةً مِنْ
لِسَانِي ﴿٢٧﴾ يَفْقَهُوا قَوْلِي ﴿٢٨﴾ وَاجْعَلْ لِي وَزِيرًا مِنْ أَهْلِي ﴿٢٩﴾ هَارُونَ
أَخِي ﴿٣٠﴾ اشْدُدْ بِهِ أَزْرِي ﴿٣١﴾ وَأَشْرِكْهُ فِي أَمْرِي ﴿٣٢﴾ كَيْ نُسَبِّحَكَ
كَثِيرًا ﴿٣٣﴾ وَنَذْكُرَكَ كَثِيرًا ﴿٣٤﴾ إِنَّكَ كُنْتَ بِنَا بَصِيرًا ﴿٣٥﴾ قَالَ قَدْ
أُوتِيتَ سُؤْلَكَ يَا مُوسَىٰ ﴿٣٦﴾ وَلَقَدْ مَنَنَّا عَلَيْكَ مَرَّةً أُخْرَىٰ ﴿٣٧﴾

٣١٣

## دەستی مووسا وەك چۆری شیر سپی بوو:

﴿[22] واضمم یدك إلی جناحك﴾ وە دەستت بخە باخەڵتەوە، لەجێیتردا ئەفەرموێ: (واضمم الیك جناحك من الرهب فذانك برهانان من ربك الی فرعون وملئه...) ٣٢/٢٨ ﴿تخرج بیضاء من غیر سوء﴾ ئەوسا بەبێ ئازار دێتە دەرێ، سپی و بێ عەیب و نەخۆشی وەك کافوری لێهاتووە, واتە: نە تووشی بەڵەکی بووە، نەهیچ شتێکی تر، بەڵکو هەروەك چرایەك بۆت هەڵگیرسابێ وایە ﴿آیة اخری﴾ ئەوەیش بێجگە لە عەساکەت موجیزەیەکیترە ﴿[23] لنریك من

آياتنا الكبرى﴾ تا ئێمه هەندێ لەنیشانە گرنگ و گەورەکانی خۆمانت نیشان بدەین و چاك بزانیت کەتوانامان بەسەر
هەمووشتێکدا هەیە. دوای نیشاندانی ئەوگشت نیشانەو دەسەڵاتانەو ئامادەکردنی مووسا، ئینجا فەرمووی: ﴿[٢٤]
إذهب إلى فرعون إنه طغى﴾ دەهەر ئێستا بڕۆ بۆلای فیرعەونی پاشای میسر، چونکە بێگومان بە یەکجاری تووڵی
لێهەڵکێشاوەو لە فەرمانم یاخی بووە.

**مووسا کە چوویە لای فیرعەون لە خوا پاڕایەوە:**

﴿[٢٥] قال رب اشرح لی صدری﴾ موسا داوای پشتیوانی لەخوا ئەکاو دەفەرموێ: ئەی پەروەردگارم! سینگم
گوشادکە ﴿[٢٦] و یسرلی امری﴾ ئیش و کاریشم بۆئاسان کە بۆگەیاندنی پەیامەکەی تۆ ﴿[٢٧] واحلل عقدة من لسانی﴾
گرێیەك کە لەزمانمدایە بۆمی بکەوە، تا زمانم نەگیرێ و
رەهابێ و بتوانم وەك پێویست پەیامەکەت ڕابگەیەنم ﴿[٢٨]
یفقهوا قولی﴾ تاله ئاخافتن و قسەکانمدا تێبگەن و حاڵی ببن
لێم ﴿[٢٩] واجعل لی وزیرا من اهلی﴾ وە لە بنەماڵەو کەس
وکارم وەزیرو یارمەتیدەرێکم بۆ دابنێ ﴿[٣٠] هارون اخی﴾
ئەویش هارونی برام بێ ﴿[٣١] اشدد به ازری﴾ پشتمی پێ
بەهێزکە ﴿[٣٢] واشرکه فی امری﴾ و لەکارمدا
کەپەیامبەریەتیە بیشیکە بەیاریدەرو هاوبەشم ﴿[٣٣] کی
نسبحك کثیرا﴾ تا ئێمە زیاتر پاك وخاوێنی تۆ ڕاگرین،
سوپاس و تەسبیحاتت زۆر بکەین ﴿[٣٤] ونذکرك کثیرا﴾ وە
زۆریش یادت بکەین، ناوت زۆر بەرین بەڵێ کەڵکی براو
برایەتی دەبێ بۆ بەهێزکردنی بەرنامەکەی خوابێ ﴿[٣٥] إنك
کنت بنا بصیرا﴾ بەڕاستیی هەمیشە تۆ بیناو زانای بە
ئەحواڵی ئێمە. بەڵێ.. هەرکارێك ئەنجام ئەدرێ، پێویستە
هەموو پێداویستییەکی بۆئامادە بکرێ، خۆئەگەر کەسێکی
شیاوتریش بۆ ئەوکارە هەبێ، ئەبێ داوای کەیت و فەزڵی
بدەیت بەسەر خۆتدا ﴿[٣٦] قال قد اوتیت سؤلك یاموسی﴾

الجزء السادس عشر   سورة طه

إِذۡ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰٓ أُمِّكَ مَا يُوحَىٰٓ ﴿٣٨﴾ أَنِ ٱقۡذِفِيهِ فِي ٱلتَّابُوتِ فَٱقۡذِفِيهِ
فِي ٱلۡيَمِّ فَلۡيُلۡقِهِ ٱلۡيَمُّ بِٱلسَّاحِلِ يَأۡخُذۡهُ عَدُوّٞ لِّي وَعَدُوّٞ لَّهُۥۚ وَأَلۡقَيۡتُ
عَلَيۡكَ مَحَبَّةٗ مِّنِّي وَلِتُصۡنَعَ عَلَىٰ عَيۡنِيٓ ﴿٣٩﴾ إِذۡ تَمۡشِيٓ أُخۡتُكَ
فَتَقُولُ هَلۡ أَدُلُّكُمۡ عَلَىٰ مَن يَكۡفُلُهُۥۖ فَرَجَعۡنَٰكَ إِلَىٰٓ أُمِّكَ كَيۡ تَقَرَّ
عَيۡنُهَا وَلَا تَحۡزَنَۚ وَقَتَلۡتَ نَفۡسٗا فَنَجَّيۡنَٰكَ مِنَ ٱلۡغَمِّ وَفَتَنَّٰكَ فُتُونٗاۚ
فَلَبِثۡتَ سِنِينَ فِيٓ أَهۡلِ مَدۡيَنَ ثُمَّ جِئۡتَ عَلَىٰ قَدَرٖ يَٰمُوسَىٰ ﴿٤٠﴾
وَٱصۡطَنَعۡتُكَ لِنَفۡسِي ﴿٤١﴾ ٱذۡهَبۡ أَنتَ وَأَخُوكَ بِـَٔايَٰتِي وَلَا تَنِيَا
فِي ذِكۡرِي ﴿٤٢﴾ ٱذۡهَبَآ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿٤٣﴾ فَقُولَا لَهُۥ قَوۡلٗا لَّيِّنٗا
لَّعَلَّهُۥ يَتَذَكَّرُ أَوۡ يَخۡشَىٰ ﴿٤٤﴾ قَالَا رَبَّنَآ إِنَّنَا نَخَافُ أَن يَفۡرُطَ عَلَيۡنَآ
أَوۡ أَن يَطۡغَىٰ ﴿٤٥﴾ قَالَ لَا تَخَافَآۖ إِنَّنِي مَعَكُمَآ أَسۡمَعُ وَأَرَىٰ
﴿٤٦﴾ فَأۡتِيَاهُ فَقُولَآ إِنَّا رَسُولَا رَبِّكَ فَأَرۡسِلۡ مَعَنَا بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ
وَلَا تُعَذِّبۡهُمۡۖ قَدۡ جِئۡنَٰكَ بِـَٔايَةٖ مِّن رَّبِّكَۖ وَٱلسَّلَٰمُ عَلَىٰ مَنِ ٱتَّبَعَ
ٱلۡهُدَىٰٓ ﴿٤٧﴾ إِنَّا قَدۡ أُوحِيَ إِلَيۡنَآ أَنَّ ٱلۡعَذَابَ عَلَىٰ مَن كَذَّبَ
وَتَوَلَّىٰ ﴿٤٨﴾ قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَٰمُوسَىٰ ﴿٤٩﴾ قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِيٓ أَعۡطَىٰ
كُلَّ شَيۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴿٥٠﴾ قَالَ فَمَا بَالُ ٱلۡقُرُونِ ٱلۡأُولَىٰ ﴿٥١﴾

قَالَ عِلۡمُهَا   ٣١٤

خواش فەرمووی: مووسا! بەڕاستیی هەرچی تۆ ویستت جێبەجێ کراو پێت درا، وە ئەمەش منەتێکە بەسەرتەوە
﴿[٣٧]ولقد مننا علیك مرة اخری﴾ وە بێگومان پێش ئەوەش ئێمە جارێکیتر منەتمان نایە سەرت، بێ ئەوە خۆت داوا
بکەیت ﴿[٣٨] إذ اوحینا إلی امك ما یوحی﴾ ئەوکاتەی کە تۆ لەدایکبووی، دایکت لە ترسی فیرعەوندا گیری خوارد
بەدەستتەوە نەوەك بتکوژێ نەیئەزانی چی بکات، جا ئێمەیش ئەوەی پێویست و شایستە بوو بۆ ئەوکارە خستمانە
دڵیەوەو پێمان گەیاند ﴿[٣٩] ان اقذفیه فی التابوت﴾ و پێمان وت: کە بیخە ناو داربەستەو سندوقێکەوە ﴿فاقذفیه فی
الیم﴾ و بیهاوێژە ناو دەریاوە ﴿فلیلقه الیم بالساحل﴾ دەبا دەریاش بیخاتە کەنار ﴿یأخذه عدو لی وعدو له﴾ تا
دوژمنێکی من و دوژمنێکی خۆی (فیرعەون)، بیگرێتەوە، بەڵێ.. یەکێ لە قیبتییەکان سندوقەکەی وەلاناو بردیە لای
فیرعەون ﴿و القیت علیك محبة منی﴾ ڤیان و خۆشەویستی خۆمم بەتۆدا، بە شێوەیەك کە هەرکەسێ تۆی دیتبا

خۆشتی ئەویست ﴿ولتصنع علی عینی﴾ وە تا لەپێش چاو خۆشمدا گەورە بیت و پەروەردە بکرێیت ﴿٤٠ إذ تمشی اختك فتقول﴾ لەبیرتە ئەوکاتە تۆ بەسندوقەکەوە کەوتیتە بەردەستی فیرعەون و، ئەوانیش زۆر گەڕان بەدوای دایەندا تاشیرت بداتێ، بەڵام ئێمە ویستمان وابوو کە تۆ شیری کەس نەخۆیت! لەوکاتەیشدا خوشکەکەت چاودێری تۆی ئەکرد لەنزیکی کۆشکی فیرعەونەوە دیتی گیریان خواردووە بە دەستیەوە گوتی: ﴿هل ادلكم علی من یکفله﴾ ئەتانەوێ کەسێکی خانەدانتان نیشان بدەم تا بەخێوی بکات بۆتان؟ ﴿فرجعناك إلی امك﴾ جا ئیتر بەوشێوەیە گێڕایتمانەوە لای دایکت وەك بەڵێنمان پێدابوو ﴿کی تقر عینها و لا تحزن﴾ کە چاوی پێت روون بێتەوەو زویرو خەفەتبار نەبێ ﴿و قتلت نفسا﴾ ئەی موسا! ئەرێ ئەمەش چاك دەزانی، کە گەورەش بوویت یەکێکت لەقیبتییەکان بەهەڵە کوشت و ناچار هەڵهاتی بۆ مەدیەن ﴿فنجیناك من الغم﴾ پاشان لەو خەم و پەژارەیەش ڕزگارمان کردیت ﴿وفتناك فتونا﴾ و بەرووداو دوای رووداو تاقیمان کردیتەوە، بەڵا دوای بەڵا، بۆئەوەی ببیتە پیاوی تەنگانەو، بۆ پاشەڕۆژ بەرگەی نەهامەتییەکانی ڕۆژگار بگریت ﴿فلبثت سنین فی اهل مدین﴾ جا هەر لەودەمەدا بەرەو مەدیەن ڕۆیشتی و، چەند ساڵێك لەناوخەڵکی ئەوێدا مایتەوە بە شوانکاریی ژیانی خۆتت دەبردە سەر ﴿ثم جئت علی قدر یا موسی﴾ پاش ئەوە (مەدیەن) گەڕایتەوە لەو کاتەدا دیاریمان کرد بوو، بۆ رەوانە کردنت بەپێغەمبەریی، هاتیت ئەی موسا ﴿٤١ واصطنعتك لنفسی﴾ و هەڵمبژاردی و کردیتم بەپەیامبەری خۆم ﴿٤٢ إذهب انت واخوك بآیاتی﴾ ئەوجا تۆو هارونی برات هاوڕێ بە (٩) نۆ نیشانەی منەوە وەك دار عەساو، دەستەکە.. بڕۆن بۆلای فیرعەون بۆ ئەنجامدانی کارەکانی من ﴿و لا تنیا فی ذکری﴾ و لەیادی مندا هەرگیز کۆتایی و سستی مەکەن، ئەوە باشترین چەك و هۆی سەرکەوتنتانە.

**لەگەڵ فیرعەون نەرم و نیان بدوون:**

﴿٤٣ إذهبا إلی فرعون إنه طغی﴾ هەردووکتان بچنە لای فیرعەون، چونکە بەڕاستیی ئەو یاخیی و لەخۆبایی بووە ﴿٤٤ فقولا له قولا لینا﴾ جا بەنەرمی و لەسەرخۆ قسەی لەگەڵ بکەن و بیدوێنن، چونکە بارەگای پاشایەتی وا هەڵئەگرێ ﴿لعله یتذکر او یخشی﴾ بەڵکو بیربکاتەوەو قسەکەتان لێوەرگرێ، وە یان بترسێ لەخوا.

**مووسا دەترسێ فیرعەون توڕە ببێ:**

﴿٤٥ قالا ربنا إننا نخاف ان یفرط علینا﴾ موساو هارون وتیان: ئەی پەروەردگاری ئێمە! ئەترسین کەفیرعەون لێمان پێش بکەوێ و هەڵکوتێتە سەرمان، وەپێش ئەوەی ڕاستیی بۆ دەربخەین سزامان بدا ﴿او ان یطغی﴾ یان یاخی ببێ ﴿٤٦ قال لا تخافا﴾ خوا دڵنیای کردن و فەرمووی: مەترسن ﴿إننی معکما﴾ بەڕاستیی من لەگەڵ ئێوەم ﴿اسمع واری﴾ هەموو شتێك ئەبیسم و هەمووشتێکیش ئەبینم ﴿٤٧ فأتیاه فقولا﴾ دەسا بچنە لایی و پێی بڵێن: ﴿إنا رسولا ربك﴾ بەڕاستیی ئێمە هەردوکمان راسپاردەو رەوانەکراوی پەروەردگاری تۆین ﴿فأرسل معنا بنی إسرائیل﴾ جا تۆیش تۆرەم و نەوەکانی یەعقوبمان لەگەڵ بنێرە ﴿ولا تعذبهم﴾ و چیتر ئەشکەنجەو سزایان مەدەو بەکارو بێگار ماندوویان مەکە ﴿قد جئناك بآیة من ربك﴾ وا بۆ ڕاست بێژی خۆیشمان بە بەڵگەو نیشانەیەکی روونەوە لەلایەن پەروەردگارتەوە هاتووین بۆلات (عەساو، دەستەکە) ﴿والسلام علی من اتبع الهدی﴾ وە سڵاو و درووود لەسەر ئەوکەسە بێ کەپەیڕەوی لەڕێگای هیدایەت دەکاو لەراستە ڕێ لاناکەوێ، بۆیە پێغەمبەریش ﷺ کاتێ نامەی بۆ (هرقل)ـی گەورەی ڕۆمەکان نووسیی، سڵاوی هەر بەم ڕستەیە کرد: (سلام علی من اتبع الهدی)، ئەمەش دەقی نامەکەیەتی هەر بۆ پیرۆزی دەینووسم: (بسم الله الرحمن الرحیم، من محمد رسول الله إلی هرقل عظیم الروم، سلام

علی من اتبع الهدی، أما بعد فإنی ادعوك بدعاية الإسلام، أسلم تسلم، يؤتك الله أجرك مرتين) متفق عليه. هەر بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبانەوە، لەموحەممەدی پێغەمبەری خواوە، بۆ هرقەلی گەورەی رۆم، درورد بۆ کەسێك لەراستە رێ لانەکەوێ، پاشانیش: من بە بانگهێشتی ئیسلام داوەتت دەکەم: موسڵمانبە، سەلامەت دەبی و، خوای گەورەش دووجار پاداش و مزەت دەداتێ. ﴿[٤٨] إنا قد أوحى إلينا أن العذاب على من كذب و تولى﴾ بێگومان ئێمە لەلایەن خواوە وەحیی و سروشمان بۆ هاتووە کە سزای خوا بۆ کەسێکە بانگەکەمان بەدرۆ دەخاتەوەو پشتی تێدەکات ﴿[٤٩] قال فمن ربكما يا موسى﴾ وتی: جا پەروەردگاری ئێوە کێیە ئەی موسا؟! ﴿[٥٠] قال ربنا الذی اعطی کل شئ خلقه ثم هدی﴾ موسا وتی: پەروەردگاری ئێمە ئەو زاتەیە کە هەمووشتێکی دروستکردووە، پاشانیش ڕێنمایی هەموو پێداویستییەکیشی کردوون ﴿[٥١] قال: فما بال القرون الأولى﴾ فیرعەون وتی: ئەی حاڵی ئەوهەموو بەرەو گەلانەی پێشووە چۆن بووە؟! خۆ ئەوان خوایان بەڕاستیی نەپەرستووە؟ ﴿[٥٢] قال: علمها عند ربی فی کتاب﴾ موسا فەرمووی: زانینی حاڵی ئەوانە لای پەروەردگارمە لەکتێبێکدا, واتە: لە (لوح المحفوظ)دا تۆمار کراوە ﴿لا یضل ربی ولا ینسی﴾ پەروەردگاری من نەهیچ شتی لێ بزر دەبێ و، نە هیچیشی لەبیر دەچێ ﴿[٥٣] الذی جعل لكم الأرض مهدا﴾ ئەو خوایەی کە زەویی بارهێناوەو کردوویە بەلانك و بێشکە بۆ ئێوەو، زۆر بەئاسانی تیایا ئەژین ﴿وسلك لكم فيها سبلا﴾ وە چەند ڕێگاو ڕێبازێکی بۆتان تێیدا دروستکرد تا لەناو شاخ و چیاو دەشتیدا بەئاسانی هاتوچۆ بکەن، لەجێیەکیدیکەشدا دەفەرموێ: (وجعلنا فیها فجاجا سبلا لعلهم یهتدون) ٣١/٢١. ﴿و أنزل من السماء ماء﴾ وە لەئاسمانیشەوە ئاوێکی ناردووەتە خوارەوە ﴿فأخرجنا به أزواجا من نبات شتی﴾ ئەوجا چەندین جۆر گژوگیای هاولفمان پێ دەرهێناوەو رواند ﴿[٥٤] کلوا وارعوا انعامكم﴾ ئێوە خۆتان لە هەندێکی بخۆن و، لەهەندێکیشی ئاژەڵەکانتان بلەوەڕێنن ﴿إن فی ذلك لآیات لأولی النهی﴾ بەراستیی لەو شتانەدا باسمان کردن گەلێ بەڵگەو نیشانەی روون هەیە لەسەر یەکتاکی خوا بۆ خاوەن ئاوەزان و فامیدەکان ﴿[٥٥] منها خلقناكم﴾ لەسەرەتاوە ئێوەمان هەرلەو زەوییە دروستکرد ﴿وفیها نعیدكم﴾ وە لەودا دوای مردن ئەتانگێڕینەوە بۆ گڵ ﴿ومنها نخرجكم تارة أخرى﴾ وە جارێکی تر لەودا ئەتانهێنینەوە دەرو زیندووتان ئەکەینەوە. خوا لەجێیەکیتردا دەفەرموێ: (یوم یدعوكم فتستجیبون بحمده وتظنون إن لبثتم إلا قلیلا) ٥٢/١٧ یان دەفەرموێ: (قال فیها تحیون وفیها تموتون ومنها تخرجون) ٢٥/٧.

الجزء السادس عشر — سورة طه

قَالَ عِلْمُهَا عِندَ رَبِّي فِي كِتَٰبٍۖ لَّا يَضِلُّ رَبِّي وَلَا يَنسَى ٥٢
ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ مَهْدًا وَسَلَكَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلًا وَأَنزَلَ
مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّن نَّبَاتٍ شَتَّىٰ ٥٣ كُلُوا۟
وَٱرْعَوْا۟ أَنْعَٰمَكُمْۗ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأَيَٰتٍ لِّأُو۟لِي ٱلنُّهَىٰ ٥٤ ۞ مِنْهَا
خَلَقْنَٰكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَىٰ ٥٥ وَلَقَدْ
أَرَيْنَٰهُ ءَايَٰتِنَا كُلَّهَا فَكَذَّبَ وَأَبَىٰ ٥٦ قَالَ أَجِئْتَنَا لِتُخْرِجَنَا
مِنْ أَرْضِنَا بِسِحْرِكَ يَٰمُوسَىٰ ٥٧ فَلَنَأْتِيَنَّكَ بِسِحْرٍ مِّثْلِهِۦ
فَٱجْعَلْ بَيْنَنَا وَبَيْنَكَ مَوْعِدًا لَّا نُخْلِفُهُۥ نَحْنُ وَلَآ أَنتَ مَكَانًا
سُوًى ٥٨ قَالَ مَوْعِدُكُمْ يَوْمُ ٱلزِّينَةِ وَأَن يُحْشَرَ ٱلنَّاسُ ضُحًى
٥٩ فَتَوَلَّىٰ فِرْعَوْنُ فَجَمَعَ كَيْدَهُۥ ثُمَّ أَتَىٰ ٦٠ قَالَ لَهُم
مُّوسَىٰ وَيْلَكُمْ لَا تَفْتَرُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا فَيُسْحِتَكُم بِعَذَابٍۖ
وَقَدْ خَابَ مَنِ ٱفْتَرَىٰ ٦١ فَتَنَٰزَعُوٓا۟ أَمْرَهُم بَيْنَهُمْ وَأَسَرُّوا۟
ٱلنَّجْوَىٰ ٦٢ قَالُوٓا۟ إِنْ هَٰذَٰنِ لَسَٰحِرَٰنِ يُرِيدَانِ أَن يُخْرِجَاكُم
مِّنْ أَرْضِكُم بِسِحْرِهِمَا وَيَذْهَبَا بِطَرِيقَتِكُمُ ٱلْمُثْلَىٰ ٦٣ فَأَجْمِعُوا۟
كَيْدَكُمْ ثُمَّ ٱئْتُوا۟ صَفًّاۚ وَقَدْ أَفْلَحَ ٱلْيَوْمَ مَنِ ٱسْتَعْلَىٰ ٦٤

الحزب ٣٢

٣١٥

**گشت نیشانەکان، نیشانی فیرعەون دران، باوەڕیشی نەهێنا:**

﴿٥٦ ولقد اريناه آياتنا كلها﴾ بێگومان ئێمە هەموو ئایەت و بەڵگەکانمان نیشانداو خستمانە پێش چاوی، تا بەشکو بڕوا بێنێ ﴿فكذب وابى﴾ کەچی ئەو هەرهەمووی بەدرۆ داناو گوێڕایەڵی نەکرد ﴿٥٧ قال اجئتنا لتخرجنا من ارضنا بسحرك يا موسى﴾ فیرعەون وتی: ئەی موسا! ئاخۆ تۆ هاتیە لامان تا لەخاك و وڵاتماندا بەو جادووەت دەرمانکەی؟ ﴿٥٨ فلنأتينك بسحر مثله﴾ جا بەدڵنیایی ئێمەیش لەوێنەی ئەوەی تۆ جادوویەکت بۆدێنین ﴿فاجعل بيننا وبينك موعدا﴾ جا ئێستا بۆ ئێمەو بۆخۆت جێ و کاتێك دیاری بکە ﴿لا نخلفه نحن ولا انت مكانا سوى﴾ کە نە ئێمە سەرپێچی لێبکەین، نەتۆش، تا لەیەك جێگایەکی تەختانیدا ئامادەبین بۆ ئەنجامدانی ئەو کارەمان ﴿٥٩ قال موعدكم يوم الزينة﴾ موسا بەدڵنیاییەکەوە وتی: باشە وادەی دیاریکراومان ڕۆژی جەژنی گشتیی بێ، ڕۆژی جەژنی نەورۆز، ڕۆژی کەیف و سەفاو سروربێ کە جەژنی ئێوەیەو لەو ڕۆژەدا ئێوە هەموو کۆ ئەبنەوە ﴿وان يحشر الناس ضحى﴾ وە لەکاتی چێشتەنگاوێکدا کە لەوکاتەدا هەوا میانەیەو، هێمان زۆریشی ئەمێنێ بۆ خۆرئاوا بوون خەڵکی کۆ بکرێنەوە تاکارەکەمان بەئاشکرا بێ ﴿٦٠ فتولى فرعون فجمع كيده ثم اتى﴾ ئینجا فیرعەون ئەوێی جێهێشت و هەموو فڕوفێڵی خۆی کۆکردەوەو خستەکار، لەپاشا هەموویانی بۆ وادەی کۆبوونەوەکە هێنا ﴿٦١ قال لهم موسى﴾ موسا ئەیەوێ پێش ئەوە دەست پێ بکەن ئامۆژگارییەکیان بکات، بەشکو واز لەو یاخی بوونەیان بێنن، بۆیە پێی وتن: ﴿ويلكم لا تفتروا على الله كذبا﴾ هاوارو وەی بۆ ئێوە! درۆ لە سەرخوا هەڵ مەبەستن، واتە: بەوەی کە بڵێن موجیزەکەی منیش جادووە وەك جادووەکەی خۆتان ﴿فيسحتكم بعذاب﴾ جا خوای گەورە گشتتان بەبەڵاو سزا تەفرو تونا بکاو لەناوتان بەرێت ﴿وقد خاب من افترى﴾ وە بێگومان کێ درۆ لەسەرخوا بکا زەرەرمەندو بێ هیوایە ﴿٦٢ فتنازعوا امرهم بينهم﴾ ئینجا ئامۆژگارییەکەی موسا کاری تێکردن، هەندێکیان دڵیان گۆڕا بەرەو خێر، بۆیە ناکۆکی و جیاوازی کەوتە نێوانیانەوە، هەندێکیان موسایان بەڕاست زانی و وتیان: ئەم قسەیە لە قسەی پێغەمبەرانە ﴿واسروا النجوى﴾ وە ملیان لە سرتە سرت و چپە چپ نا ﴿٦٣ قالوا إن هذان لساحران﴾ وتیان: دیارە ئەم دووانە موساو هاروون جادووگەرن ﴿يريدان ان يخرجاكم من ارضكم بسحرهما﴾ ئەیانەوێ بە هۆی جادوویانەوە لەوڵاتی (میسر)دا بتانکەنە دەرەوە، تا دەسەڵات بەدەست بگرن ﴿ويذهبا بطريقتكم المثلى﴾ و بەرنامەو نەریتە هەرە بە نرخەکەی ئێوە پووچەڵ بکەنەوە ﴿٦٤ فأجمعوا كيدكم﴾ جا کەواتە فڕوفێڵتان یەکخەن ﴿ثم ائتوا صفا﴾ لەپاشا هەموو بە ریزێك وەرن ﴿وقد افلح اليوم من استعلى﴾ وە بێگومان ئەمڕۆش هەرکەسێ سەرکەوێ سەرفرازو بەختیارە.

**مووسا سەرکەوت و جادووگەرەکانیش موسڵمان بوون:**

﴿٦٥ قالوا: يا موسى إما ان تلقى﴾ ئەوسا جادوگەرەکان بە دەعیەو بەفیزەوە وتیان: ئەی موسا! یا تۆ یەکەمجار دەسبەکاربە، عەساکەت هەڵدەو جادووی خۆت بکە ﴿واما ان نكون اول من القى﴾ وەیان ئێمە پێش تۆ دەهاوێژین و یەکەم کەس ئەبین؟؟ ﴿٦٦ قال بل القوا﴾ موسا وتی: نا، یەکەمجار ئێوە دەست پێ بکەن و بیهاوێژن ﴿فإذا حبالهم وعصيهم يخيل إليه من سحرهم﴾ بەڵێ.. ئەوان دەستپێشخەرییان کرد، جا پەت و گوریس و گۆچانەکانیان هەڵدایە گۆڕەپانی جادووەکەوە ئەوەندە سەر سوڕهێنەر بوو مووسا وا گومانی برد لە جادووەکەیان ﴿انها تسعى﴾ پەتەکان و عەساکانیان ئەجووڵێنەوەو دێن و دەچن وەك (مار)ێکی گەورە. (ئیبن کەسیر) ئەڵێ: بەو هۆیەوە کە لە(جیوە)یان هەڵکێشابوون گشت دەجولانەوەو، دۆڵ و شیوەکەیان پڕ کرد لە مارو هەڵمەت هەڵمەت

بەسەریەکا دەکەوتن ﴿ ٦٧ فأوجس فی نفسه خیفة موسی﴾ جا لەبەرئەوە موسا کە ئەوەی دیت لەدڵی خۆیدا کەمێك
ترسا کە خەڵکەکە پاش ئەوکارەیە شوێنی نەکەون و، بەکارەکەی ئەویش بڵێن جادووە ﴿ ٦٨ قلنا لا تخف إنك أنت
الأعلی﴾ ئێمەش لەوکاتە ناسکەدا وەحیمان بۆکردو وتمان: هیچ مەترسە! بەڕاستیی هەر تۆ لەسەر تری ﴿ ٦٩ والق
ما فی یمینك﴾ ئەوی لە دەستی ڕاستتدایە (عەساکەت) بیهاوێژە ﴿تلقف ما صنعوا﴾ جا هەرچی ئەوانە کردوویانە
هەمووی قوت ئەدا و ئەیپێچێتەوە ﴿إنما صنعوا کید ساحر﴾ بێگومان هەرچی ئەوانە کردیان هەموو فرت وفێڵی
جادووگەر بوو ﴿ولا یفلح الساحر حیث أتی﴾ و جادووبازیش هەرچی بکاو لە هەرکوێ بێ سەرکەوتوو نابێ،
کەوایە زۆر بە دڵنیاییەوە کاری خۆت بکە ئەی مووسا. (جوندوب) ئەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((إذا أخذتم -
یعنی الساحر- فاقتلوه ثم قرأ: ((ولا یفلح الساحر حیث
أتی))، قال: لا یؤمن حیث وجد) ئیبن ئەبی حاتەم. هەرکە
جادووبازتان دەسکەوت بیکوژن، پاشان ئایەتی (ولا یفلح
الساحر..)ی خوێندەوەو فەرمووی: جادووگەر لەهەر کوێ
بێت بڕوای نیە. ﴿ ٧٠ فألقی السحرة سجدا﴾ هەر کە موسا
عەساکەی خۆی هەڵداو تەواوی پەت و عەساکانی ئەوانی
قوتدا, بەخێرایی جادووگەرەکان هەموو کەوتنە سوژدە و
کڕنووشیان برد بۆ پەروەردگارو، زانییان کە ئەم کارە
لەدەسەڵاتی ئادەمزاددا نییە ﴿قالوا: آمنا برب هارون
وموسی﴾ لەڕووی فیرعەون وئەو هەموو خەڵکەدا وتیان:
بڕوامان هێنا بەپەروەردگاری هاروون وموسا!

**فیرعەون هەڕەشەی لە جادووگەرەکان کرد:**

﴿ ٧١ قال آمنتم له قبل ان آذن لکم﴾ جا کە فیرعەون
ئەوەی دیت، گوتی: پێش ئەوەی من مۆڵەتتان بدەم بڕواتان
پێ هێنا؟! ﴿إنه لکبیرکم الذی علمکم السحر﴾ بە ڕاستی
دەرکەوت کەهەر موسایە گەورەو سەرۆکتان وئەویش فێری
جادووی کردوون ﴿فلأقطعن أیدیکم وأرجلکم من خلاف﴾
ئەمەیش سوێندی بێت هەموو دەست و پایەکانتان ڕاست وچەپ دەبڕم ﴿ولأصلبنکم فی جذوع النخل﴾ وەبە
دارخورماکاندا هەڵتاندەواسم. تا خەڵکی تر عیبرەت وەرگرن ﴿ولتعلمن اینا اشد عذابا وابقی﴾ وەدەشزانن سزای
کاممان سزای ئێمە, یان سزای خواکەی مووسا توندترو بەماوەترە؟ ﴿ ٧٢ قالوا لن نؤثرك علی ماجاءنا من البینات﴾
ئەوانیش گوتیان: تازە ئیتر ئێمە هەرگیز دوای ئەو نیشانانە دیومانن لەبەرتۆ دەس لەو هەڵناگرین.﴿والذی فطرنا﴾
وە ڕێزی تۆنادەین بەسەر ئەو زاتەدا ئێمەی دروست کردووە، سوێندمان پێی ﴿فاقض ما انت قاض﴾ ساتۆ
هەربڕیارێ دەدەیت بەرامبەرمان بیدە، یا هەرچیت لەدەستدێ دریغی مەکە ﴿إنما تقضی هذه الحیاة الدنیا﴾
بەڕاستی تۆ هەر تەنها لەم ژیانی دونیایەدا دەستت دەڕواو دەسەڵاتت هەیەو کارێکت پێ ئەکرێ ﴿ ٧٣ إنا آمنا بربنا
لیغفر لنا خطایانا﴾ بێگومان ئێمە بڕوامان بەپەروەردگاری خۆمان هێنا تالە گوناهەکانمان خۆش ببێ.﴿وما

الجزء السادس عشر — سورة طه

قَالُوا يَا مُوسَىٰ إِمَّا أَن تُلْقِيَ وَإِمَّا أَن نَّكُونَ أَوَّلَ مَنْ أَلْقَىٰ (٦٥) قَالَ
بَلْ أَلْقُوا فَإِذَا حِبَالُهُمْ وَعِصِيُّهُمْ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مِن سِحْرِهِمْ أَنَّهَا تَسْعَىٰ
(٦٦) فَأَوْجَسَ فِي نَفْسِهِ خِيفَةً مُّوسَىٰ (٦٧) قُلْنَا لَا تَخَفْ إِنَّكَ
أَنتَ الْأَعْلَىٰ (٦٨) وَأَلْقِ مَا فِي يَمِينِكَ تَلْقَفْ مَا صَنَعُوا إِنَّمَا صَنَعُوا
كَيْدُ سَاحِرٍ وَلَا يُفْلِحُ السَّاحِرُ حَيْثُ أَتَىٰ (٦٩) فَأُلْقِيَ السَّحَرَةُ سُجَّدًا
قَالُوا آمَنَّا بِرَبِّ هَارُونَ وَمُوسَىٰ (٧٠) قَالَ آمَنتُمْ لَهُ قَبْلَ أَنْ آذَنَ
لَكُمْ إِنَّهُ لَكَبِيرُكُمُ الَّذِي عَلَّمَكُمُ السِّحْرَ فَلَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ
وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَافٍ وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ فِي جُذُوعِ النَّخْلِ وَلَتَعْلَمُنَّ
أَيُّنَا أَشَدُّ عَذَابًا وَأَبْقَىٰ (٧١) قَالُوا لَن نُّؤْثِرَكَ عَلَىٰ مَا جَاءَنَا مِنَ
الْبَيِّنَاتِ وَالَّذِي فَطَرَنَا فَاقْضِ مَا أَنتَ قَاضٍ إِنَّمَا تَقْضِي هَٰذِهِ
الْحَيَاةَ الدُّنْيَا (٧٢) إِنَّا آمَنَّا بِرَبِّنَا لِيَغْفِرَ لَنَا خَطَايَانَا وَمَا أَكْرَهْتَنَا
عَلَيْهِ مِنَ السِّحْرِ وَاللَّهُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ (٧٣) إِنَّهُ مَن يَأْتِ رَبَّهُ مُجْرِمًا
فَإِنَّ لَهُ جَهَنَّمَ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحْيَىٰ (٧٤) وَمَن يَأْتِهِ مُؤْمِنًا قَدْ
عَمِلَ الصَّالِحَاتِ فَأُولَٰئِكَ لَهُمُ الدَّرَجَاتُ الْعُلَىٰ (٧٥) جَنَّاتُ عَدْنٍ
تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَذَٰلِكَ جَزَاءُ مَن تَزَكَّىٰ (٧٦)

٣١٦ — ولقد أوحينا

**اكرهتنا عليه من السحر** ﴾ وەلەو جادووگەریەش تۆ سەپاندت بەسەرماندا ببورێ ﴿ **والله خير وابقى** ﴾ وە خوا لەهەمووكەسێ چاكتروبە بەقاترە، بەڵام تۆ خۆت و دەوڵەتەكەت دواییتان دێت. ﴿[٧٤] **إنه من يأت ربه مجرما** ﴾ بەڕاستی هەر كەسێك بەتاوانباری لە ڕۆژی قیامەتدا بچێتەوە لای پەروەردگاریی ﴿ **فإن له جهنم لايموت فيها ولايحيى** ﴾ بێگومان بەشی دۆزەخەو ئیتر نەئەمرێ تیایدا, تا لەسزا ڕزگاری ببێت، وە نە دەشژی بەئاسوودەیی، وەك خوای گەورە ئەفەرموێ: (لايقضى عليهم فيموتوا ولا يخفف عنهم من عذابها كذلك نجزى كل كفور) ٣٥/ ٣٦ ﴿[٧٥] **ومن يأته مؤمنا** ﴾ وە ئەوكەسەش بڕوای هێنابێ و بەباوەڕەوە بچێتە لای پەروەرد گاری خۆی ﴿ **قد عمل الصالحات** ﴾ ئاكاروكردەوەچاكەكانی ئەنجام دابێت ﴿ **فأولئك لهم الدرجات العلى** ﴾ جا ئەوانە لەدواڕۆژدا چەندان پلەی بەرزیان هەیە: ﴿[٧٦] **جنات عدن تجرى من تحتها الأنهار خالدين فيها** ﴾ چەند باخ وباخاتێكی چڕوپڕن و بەهەتا هەتاییش تێیاندا دەمێننەوە, لەبەردەمیانەوە چەند چۆم ورووبار تێدەپەڕێ كەجوانترین سیماو وێنەی هەیە ﴿ **وذلك جزاء من تزكى** ﴾ وەئەو پاداشت وخۆشیی وئیسراحەتەیە پاداشتی كەسانی دڵ ودەرون پاكە, واتە: ئەوانەی خۆیان پاك ڕاگرتبێ لەبت پەرستیی، خەڵك پەرستیی، فیرعەون پەرستیی. (ئەبووسەعید) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((إن أهل الدرجات العلى ليراهم من تحتهم كما ترون الكوكب الدرى فى أفق السماء، وإن أبابكر وعمر منهم وأنعما)) أخرجه أحمد وأبوداود و الترمذى. بێ سۆ خەڵكانی خاوەن پلە بەرزەكان (لەبەهەشتدا)، خەڵكانی خوارووی لای خۆیان دەیانبینن و بۆیان دەنوارن هەروەكو بۆ ئەستێرەی پرشنگدار لە ئاسۆی ئاسماندا بنوارن، ئەبوبەكرو عومەریش هەر لەوانن و خەریكی نازونیعمەت و خۆشین.

**مووساو بەنی ئیسرائیل لە میسر دەرچوون:**

لێرەدا ئەو دیمەنە تەواو ئەبێ و، بەشێكی تری داستانەكەی موسا دەست پێدەكات وەك دەفەرموێ: ﴿[٧٧] **ولقداوحينا إلى موسى** ﴾ بێگومان ئێمە سروشمان بۆ موساكرد: ﴿ **أن اسر بعبادى** ﴾ كە شەو لەتەك بەندەكانم لەڕێگەی دەریاوە لە میسر دەرچۆ ﴿ **فاضرب لهم طريقا فى البحر يبسا** ﴾ ڕێگایەكی وشكانییان لە دەریای نیلدا بۆ بكەرەوە ﴿ **لاتخاف دركا ولا تخشى** ﴾ نەبترسە لە لەشكرەكەی فیرعەون پێت بگا، نەخەمی نقوم بوونشیت هەبێت، چونكە ئێمە چاودێرتانین ﴿[٧٨] **فاتبعهم فرعون بجنوده** ﴾ موسا بەفەرمانی خوا كارەكەی خۆی ئەنجامدا، جاكاتێ فیرعەون پێیزانین ئەوسا بەخۆیو سوپاكەیەوە وە دوویان كەوت بەناو نیلدا، چونكە لەپێش چاو ئەوەوە دەریاكە وشك و برنگبوو ﴿ **فغشيهم من اليم ما غشيهم** ﴾ كتوپڕ شەپۆلی دەریا هاتەسەریان و داپیۆشین و هەموویانی نقوم كرد ﴿[٧٩] **واضل فرعون قومه وما هدى** ﴾ سەرئەنجام فیرعەون ڕێ ڕاستەكەی لە گەلەكەی هەڵە كردو، نەیتوانی ڕێنوێنییان بكا.

الجزء السادس عشر | سورة طه

وَلَقَدْ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِى فَٱضْرِبْ لَهُمْ طَرِيقًا فِى ٱلْبَحْرِ يَبَسًا لَّا تَخَٰفُ دَرَكًا وَلَا تَخْشَىٰ ﴿٧٧﴾ فَأَتْبَعَهُمْ فِرْعَوْنُ بِجُنُودِهِۦ فَغَشِيَهُم مِّنَ ٱلْيَمِّ مَا غَشِيَهُمْ ﴿٧٨﴾ وَأَضَلَّ فِرْعَوْنُ قَوْمَهُۥ وَمَا هَدَىٰ ﴿٧٩﴾ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ قَدْ أَنجَيْنَٰكُم مِّنْ عَدُوِّكُمْ وَوَٰعَدْنَٰكُمْ جَانِبَ ٱلطُّورِ ٱلْأَيْمَنَ وَنَزَّلْنَا عَلَيْكُمُ ٱلْمَنَّ وَٱلسَّلْوَىٰ ﴿٨٠﴾ كُلُوا۟ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقْنَٰكُمْ وَلَا تَطْغَوْا۟ فِيهِ فَيَحِلَّ عَلَيْكُمْ غَضَبِى ۖ وَمَن يَحْلِلْ عَلَيْهِ غَضَبِى فَقَدْ هَوَىٰ ﴿٨١﴾ وَإِنِّى لَغَفَّارٌ لِّمَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا ثُمَّ ٱهْتَدَىٰ ﴿٨٢﴾ ۞ وَمَآ أَعْجَلَكَ عَن قَوْمِكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿٨٣﴾ قَالَ هُمْ أُو۟لَآءِ عَلَىٰٓ أَثَرِى وَعَجِلْتُ إِلَيْكَ رَبِّ لِتَرْضَىٰ ﴿٨٤﴾ قَالَ فَإِنَّا قَدْ فَتَنَّا قَوْمَكَ مِنۢ بَعْدِكَ وَأَضَلَّهُمُ ٱلسَّامِرِىُّ ﴿٨٥﴾ فَرَجَعَ مُوسَىٰٓ إِلَىٰ قَوْمِهِۦ غَضْبَٰنَ أَسِفًا ۚ قَالَ يَٰقَوْمِ أَلَمْ يَعِدْكُمْ رَبُّكُمْ وَعْدًا حَسَنًا ۚ أَفَطَالَ عَلَيْكُمُ ٱلْعَهْدُ أَمْ أَرَدتُّمْ أَن يَحِلَّ عَلَيْكُمْ غَضَبٌ مِّن رَّبِّكُمْ فَأَخْلَفْتُم مَّوْعِدِى ﴿٨٦﴾ قَالُوا۟ مَآ أَخْلَفْنَا مَوْعِدَكَ بِمَلْكِنَا وَلَٰكِنَّا حُمِّلْنَآ أَوْزَارًا مِّن زِينَةِ ٱلْقَوْمِ فَقَذَفْنَٰهَا فَكَذَٰلِكَ أَلْقَى ٱلسَّامِرِىُّ ﴿٨٧﴾

حزب ٣٢

**بەنی ئیسرائیل! ئەم بەخششانەتان لەیاد بێ:**

دوای سەرکەوتن ڕووئەکاتە ئەو بەنی ئیسرائیلیانەی ڕزگاریان ببوو, نیعمەتەکانی خۆی وەبیریان دێنێتەوە تاهەرگیز لەبیریان نەچێتەوەو هەرسوپاسی بکەن , وەك ئەفەرموێ: ﴿٨٠ یا بنی إسرائیل قد أنجیناكم من عدوكم﴾ ئەی نەوەکانی یەعقوب! بێگومان ئێوەمان لە چنگی دوژمنیخۆتان ڕزگار کرد ﴿وواعدناكم جانب الطور الأیمن﴾ بەلێنیشماندانێ لە لای ڕاستی کێوی (توور)دابە پێدانی تەورات ﴿ونزلنا علیكم المن والسلوى﴾ لە ڕۆژە سەختەکانیشدا فریاتان کەوتین، ئەوەبوو لەودەشتە چۆڵەدا گەزۆو مەلی شێلاقە (هەوێردە)مان بۆناردنە خوارێ، ئێوەش بەئاسانی ڕاوتان دەکردن ﴿٨١ كلوا من طیبات ما رزقناكم﴾ پێمان وتن: لەو ڕزق وڕۆزییە چاك و پاکانەی پێمان داون بخۆن ﴿ولاتطغوا فیه﴾ وەلەو ژیانە خۆشەدا ستەم وسەرکەشی مەکەن ﴿فیحل علیكم غضبی﴾ تا تووڕە بوونم بێتە سەرتان ﴿ومن یحلل علیه غضبی فقد هوى﴾ هەرکەسێ ڕق و تووڕە بوونی من بێتە سەری، ئەوە بەهەقیقەت تیا ئەچێ ﴿٨٢ وإنی لغفار لمن تاب وآمن وعمل صالحا ثم اهتدى﴾ وە بێگومان من بەرامبەر بەوکەسەی تەوبەکارو پەشیمان و، بڕوادارو ئاکارچاك بێ، پاشا ڕێگای ڕاستی گرتبێ,زۆر لێبوردەو بەخشەرم. لێرە دیمەنی سەرکەوتن و بەختیاریی تەواو ئەبێ.

**تا مووسا لە گور گەڕایەوە قەومەکەی بوونە گوێرەکە پەرست:**

ئەوجا لەدیمەنی پاڕانەوەو لاڵەدا (مووسا) لەلای کێوی (طوور)دا دەبینین، خوا فەرمووی: ﴿٨٣ وما أعجلك عن قومك یا موسى﴾ ئەی موسا! چیپەلەی لێنایتە وە,وا لەگەلەکەت پێشکەوتی هەتا زووتر بگەیتە کێوی توور؟! بەڵێ پێشتر خوا بەڵێنی بە موسا دابوو کەدوای چل ڕۆژ پیاوماقووڵانی گەلەکەی لەتەك خۆی بێنێ بۆ خزمەت پەروەردگاریی. جا ئەویش لەگەڵ حەفتا کەسدا هاتن و ئەوانی لە خوار کێوەکەدا بەجێ هێشت ﴿٨٤ قال هم أولاء على أثری﴾ مووسا گوتی: ئەوانیش وان لەدوامەوە ﴿وعجلت إلیك رب لترضى﴾ من پەلەم کرد بۆلای تۆ, تا خۆشنوودو ڕازیی بێ ﴿٨٥ قال فإنا قد فتنا قومك من بعدك﴾ خوا فەرمووی: بێگومان دوای هاتنی تۆ ئێمە گەلەکەتمان تاقیکردەوە ﴿وأضلهم السامری﴾ وە سامریی گومڕایکردن بە گوێرەکە پەرستن، چونکە کاتی خۆی ئەوەندە لەناو کۆیلەگەرییدا مابوونەوە سرووشتییان بەزیبوو.. بۆیە خێرا چوونە سەرقسەی سامیریی ﴿٨٦ فرجع موسى إلى قومه غضبان أسفا﴾ ئینجا موسا کاتێ ئەوەی بیست دوای جێبەجێ کردنی کارەکەی بەپەلەو زۆر دڵ بە مەراق و بەخەفەت وخەشمەوە گەڕایەوە بۆ لای گەلەکەی ﴿قال یاقوم ألم یعدكم ربكم وعدا حسنا﴾ وتی: هۆزی من! ئاخۆ پەروەردگارتان بەڵێنی باشی پێنەدان بەخێرو خۆشی دونیاوئاخیرەت ﴿أفطال علیكم العهد﴾ یاخۆ کەمن بەجێم هێشتن زۆرم پێچوو؟ تا ئێوە ئەو هەموو چاکەیەتان لەبیربچێتەوە؟!﴿أم أردتم أن یحل علیكم غضب من ربكم﴾ یاهەر ویستتان بەرسزای پەروەردگارتان بکەون, چونکە ئەوکارەی ئێوە کاری کەسێکە کە بەدەست ئەنقەست بیەوێ دووچاری سزای خوا بێت ﴿فأخلفتم موعدی﴾ واپەیمانی منتان شکاند و لەدژی بەڵێنەکەی من جووڵانەوە، ئەی بڕیار وانەبوو لەسەر یەکخواپەرستیی بمێننەوە؟ ﴿٨٧ قالوا ما أخلفنا موعدك بملكنا﴾ ئەوانیش ئەیانەوێ داوای لێبوردن بکەن و پاساو بێننەوە, بۆیە وتیان: ئێمە بەدەسەڵات و ویستی خۆمان سەرپێچیمان لەفەرمانەکەی تۆ نەکرد ﴿ولكن حملنا أوزارا من زینة القوم﴾ بەڵکو کاتێ کە دەرچووین زێڕو زیوێکی ژنە میسریەکان – کە گیریان خواردبوو بە دەستیەوە– لە کۆڵ نابووین ﴿فقذفناها﴾ جا بەناچاری فڕێمان دایە ناو بۆتەکە کەوەوپربوو لەئاگر ﴿فكذلك ألقى السامری﴾ سامیریش هەروا بەو جۆرە فرت وفێڵی خۆی گێڕاو فڕێیدایە سەر جێپێی ئەسپەکەی

جوبرەئیل و ئەنجامەکەی ئەمە دەرچوو ﴿٨٨ فأخرج لهم عجلا جسدا له خوار﴾ ئیتر – لەخشڵەکە- پەیکەری گوێلکێکی بۆ سازدان, کە دەنگ وبۆڕەی دەهات!. ئەڵێن: سامریی تەواوی زێڕەکەی لێوەرگرتن و فڕێیدایەناو بۆتەکەوەو توانیەوەو قاڵبێکی گوێرەکەی بۆ داڕشتن، ئەو جا زێرو زیوەکەی ڕژاند بەسەریاو جارجارێك بۆڕەیەکی لێوە دەهات ﴿فقالوا هذا إلهكم وإله موسى﴾ ئەوسا سامیری وگەلە بێ دینەکەی وتیان: ئەمە خوای ئێوەو، خوای موساشە ﴿فنسي﴾ جا ئەو لەبیری چوو کە خوا لێرەیە، ئەگینا نەدەچوو بۆ کێوی (طوور) ﴿٨٩ افلا يرون الا يرجع إليهم قولا ولا يملك لهم ضرا ولا نفعا﴾ ئاخۆ ئەوانە کە ئەو گوێلکە ئەپەرستن نابینن کە ئەو گوێلکەیە نە وەڵامێکیان دەداتەوە ئەگەر داوایەکی لێبکەن وە نە دەسەڵاتی زیانێکی بۆ یان هەیە, واتە: هەر هیچ نەبێ وەکو گوێرەکەی خواکردیش نییە، جۆرە کەڵکێکی لێوەربگیرێ، ئەی ئیتر ئەوانە بۆچی ئەوەندە کەو دەنن؟ (ئیبن کەسیر) دەڵێت: پوختەی ئەو شتەی کە ئەو نەفامانە کردیانە بیانوو بۆ خۆیان بەم جۆرە بوو کە: خشڵ و زێڕەکەیان بە حەرام دەزانی، لەبەر ئەوە فڕێیان دا، کەچی لەو لاوە گوێرەکە دەپەرستن!! واتە: لە گوناهی بچووك سڵ دەکەنەوە, کەچی گوناهە گەورەکان دەکەن، ئەمە وەك ئەوە وایە کە لە ریوایەتێکی راستدا هاتووە: (عن ابن عمر انه سأله رجل من أهل العراق عن دم البعوض إذا أصابت الثوب- يعني هل يصلي فيه أم لا؟- فقال ابن عمر: انظروا إلى أهل العراق قتلوا ابن بنت رسول الله ﷺ – يعني الحسين – وهم يسألون عن دم البعوض) فتح الباري، مسند الإمام أحمد. واتە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر- خوالێیان رازیی بێ- پیاوێکی عێراقی پرسیاری خوێنی میشوولەی لێدەکات، ئایا نوێژییە یان نا؟ لە وەڵامدا وتی: تەماشای سەلیقەی عێراقیەکان بکە! لەلایەکەوە (حسین)ـی کچەزای پێغەمبەر ﷺ دەکوژن! لەم لایشەوە لەخوێنی مێشوولە دەپرسن!.

سُورَةُ طه — الجزء السادس عشر

فأخرج لهم عجلا جسدا له خوار فقالوا هذا إلهكم وإله موسى فنسي ﴿٨٨﴾ أفلا يرون ألا يرجع إليهم قولا ولا يملك لهم ضرا ولا نفعا ﴿٨٩﴾ ولقد قال لهم هارون من قبل يا قوم إنما فتنتم به وإن ربكم الرحمن فاتبعوني وأطيعوا أمري ﴿٩٠﴾ قالوا لن نبرح عليه عاكفين حتى يرجع إلينا موسى ﴿٩١﴾ قال يا هارون ما منعك إذ رأيتهم ضلوا ﴿٩٢﴾ ألا تتبعن أفعصيت أمري ﴿٩٣﴾ قال يا ابن أم لا تأخذ بلحيتي ولا برأسي إني خشيت أن تقول فرقت بين بني إسرائيل ولم ترقب قولي ﴿٩٤﴾ قال فما خطبك يا سامري ﴿٩٥﴾ قال بصرت بما لم يبصروا به فقبضت قبضة من أثر الرسول فنبذتها وكذلك سولت لي نفسي ﴿٩٦﴾ قال فاذهب فإن لك في الحياة أن تقول لا مساس وإن لك موعدا لن تخلفه وانظر إلى إلهك الذي ظلت عليه عاكفا لنحرقنه ثم لننسفنه في اليم نسفا ﴿٩٧﴾ إنما إلهكم الله الذي لا إله إلا هو وسع كل شيء علما ﴿٩٨﴾

٣١٨ — كذلك نقص

## هارون لە گوێرەکە پەرستن ڕێی لێگرتن:

﴿٩٠ ولقد قال لهم هارون من قبل﴾ بێگومان لە پێش گەڕانەوەی موسادا هاروونیش پێیگوتن: ﴿يا قوم إنما فتنتم به﴾ ئەی هۆزی من! وریا بن! ئێوە بەو گوێرەکە زێڕینەیە تاقیکراونەتەوە، دەسا فریو مەخۆن و مەیپەرستن ﴿وإن ربكم الرحمن فاتبعوني﴾ و بەراستی پەروەردگارتان خوا بەخشندەکەیە, دە شوێنی من کەون ﴿واطيعوا امري﴾ و فەرمانی من جێبەجێ بکەن" گوێرەکە مەپەرستن ﴿٩١ قالوا لن نبرح عليه عاكفين﴾ کەچی دوای ئەم هەموو قسەو ئامۆژگاریە وتیان: هەرگیزای هەرگیز ئێمە لەو گوێلکە دەست هەڵناگرین و، هەر بەردەوام لەلای دەمێنینەوە و ئەیپەرستین ﴿حتى يرجع إلينا موسى﴾ تاموسا ئەگەڕێتەوە لامان بابزانین ئەو چی ئەڵێت؟

**مووسا پاش گەڕانەوەی لەگەڵ هاروون:**

﴿٩٢ قال یاهارون مامنعك إذ رایتهم ضلوا﴾ موسا کەبەو هەموو ڕق وو خەشمەوە گەڕایەوە وتی: هارون! کە دیتت ئەوانە گومڕا بوون چی وای لێکردیت ﴿٩٣ الا تتبعن﴾ کە بەزوویی نەیەت بەدوامداو بەسەرهاتەکەم بۆ باس بکەیت؟! ﴿افعصیت امری﴾ ئاخۆ تۆش سەرپێچی فەرمانەکەمت کردو قسەکەمت شکاند، ئەی پێم نەگوتی تۆ جێگری منی؟ جابە توندی مووی سەرو ڕیشی ڕاکێشا ﴿٩٤ قا یا ابن ام لا تأخذ بلحیتی ولا براسی﴾ هاروون ئەیەوێت بەوشەی (یاابن أم) سەرنجی موسا ڕاکێشێت -ئەگەر چی برای باوك ودایکییەتی- بۆیە وتی: ئەی کوڕی دایکم! ڕیش و قژم مەگرە، ﴿إنی خشیت ان تقول فرقت بین بنی إسرائیل ولم ترقب قولی﴾ من بۆیە بەزوویی ئاگادارم نەکردیت لەوە ترسام پێم بڵێیت: تۆ جیاوازیت خستە ناو بەنی ئیسرائیل و چاوەڕوانی قسەی منت نەکرد بەڵێ.. ڕاستە موسا هارونی کردە جێنشینی خۆی، بەڵام ئەمیش لەترسی دروستبوونی دوو بەرەکی نەیوێرا بە خێرایی هەواڵەکەی پێ بگەیەنێت.

**سامری و ئەنجامدانی گوێلکەکە:**

﴿٩٥ قال فما خطبك یا سامری﴾ ئینجا موسا ڕووئەکاتە سامیریی و، پێی ئەڵێت: ئەی سامیریی! ئەم کارە خەتەرناکە چبوو ئەنجامت دا؟. (سەیید) ئەڵێ: بۆیەلە سەرەتاوە ڕوویکردە سامیریی، چونکە بە پلەی یەکەم خەڵکەکە خۆیان بەرپرسیارن و نابێ دوای هەموو زایەڵەو ئاپۆڕایەك بکەون. لە(ئیبن عەباس)ـەوە ئەگێڕنەوە: سامیریی لە بنەڕەتا خەڵکی گوندی (باجرما) ی (جەزیرە) یەو، گاپەرس بوونە، ئەمیش زۆر وەك ئەوان حەزی لێدەکرد، ئەگەرچی لەگەڵ (بەنی ئیسرئیل)ییەکاندا موسڵمان ببوو! لەڕیوایەتێکیتردا ئەڵێن: خەڵکی (کرمان)ـە، (قەتادە)ش ئەڵێ: خەڵکی (سامەڕا)ی عێراقە. ﴿٩٦ قال بصرت بما لم یبصروا به﴾ سامیری وتی: من شتێکم دیت و ئاگاداربووم لێی، ئەوانی دی نەیان دی و لێی بە ئاگا نەبوون ﴿فقبضت قبضة من اثر الرسول فنبذتها﴾ لەجێ پێی ئەسپەکەی جوبریل کاتێ هات بۆ لەناوبردنی فیرعەون لاویچە خۆڵێکم هەڵگرت و ئەویشم هاویشتە ناوی. ڕاڤەکەرانی قورئان دەڵێن: جوبریل سواری ئەسپێك ببوو، پێی بەهەرشتێکا بنابا جێگە پێکەی سەوز ئەبوو، ئەمیش مشتێ لەو خۆڵەی هێناو کردیە ناو زێڕەکەوەو، ئیترچونکە بڕیاری خوای لەسەربوو، جارجارێك دەنگێکی لێوە دەهات ودەیبۆڕاند، ئیتر لەوەوەخەڵکەکەش پەرستیان. سەیید -خوا پلەی بەرزبکاتەوە- پاش لە بێژنگدانی هەموو ئەو ڕیوایەتانە لەو بارەیەوە هاتوون دەڵێت: ئەوی من پێم باش بێت ئەمەیە کە: سامیریی هەر خۆی ئەو شتەی هەڵبەست و ویستی لەو کارە خۆی قوتار بکات، چونکە لەوەدەچێت ئەوبەزیرەکی خۆی ئەو گوێرەکەیەی لەزێڕی میسرییەکان دروستکردبێ و لەپاشان با هاتبێ و چووبێ بەناو پەیکەرەکەداو بۆڕەی لێوە هاتبێ ﴿وکذلك سولت لی نفسی﴾ ئاوەها نەفسم ئەوەی لا شرینکردم، دیارە ئەمە داوای پۆزشی لێبوردنە، نەك پەشیمان بوونەوە لە گوناهەکەی ﴿٩٧ قال فاذهب فإن لك فی الحیاة ان تقول لا مساس﴾ بۆیە موسا لەو کۆمەڵگەیە دەری ئەکاو پێی وت: دەسا بڕۆ گومبە! دەشێ تاماوی لەژیانی دونیادا هەرکەسێکت لێ نزیك بکەوێتەوە بڵێیت: نزیکم مەکەوەو، دەستم لێمەدە. لە ئایینی موسادا سزای هەندێ گوناح دەرکردن بووە لە کۆمەڵگەو، نەدەبوو نە ئەو نزیکی ئەو خەڵکە بکەوێتەوەو، نە خەڵکیش نزیکی ئەو ببنەوە، وەك گولی دوور لە ئاوایی لێ بێت ﴿وإن لك موعدا لن تخلفه﴾ دڵنیاشبە چارەنووس و کاتێکت بۆدیاریکراوە، هەردێت و هەرگیز ناشتوانی لێی دەربازبیت ﴿وانظر الی إلهك الذی ظلت علیه عاکفا﴾ وە ئێستاش بنواڕە ئەوخوایە (گوێلکەکە)ت کە هەمیشە بەلایەوە کەوتبویت و ئەتپەرست

﴿لنحرقنه﴾ بە تەئكیدئاگری دەدەین ودەیسوتێنین ﴿ثم لننسفنه فی الیم نسفا﴾ لەپاشا خۆڵەكەشی لەو دەریایە
پـرژو بـڵاو دەكـەین وشوێنەواری نـاهێڵین ﴿٩٨ إنمـا إلهكـم الله الـذی لا إلـه إلا هـو﴾ دڵنیـابن كـە ئـەوە خـوا نـەبوو،
پەرستراوتان هەر تەنها ئەو زاتەیە، كە جگەلەو هیچ پەرستراوێكی تر بەهەق نییە ﴿وسع كل شئ علما﴾ و زانیاریی
وزانستی ئەو، هەمووشتێكی داگرتووەو ئاگای لە هەمووشتێكە ﴿٩٩ كذلك نقص علیك من انباء ما قد سبق﴾ ئابەو
شێوەیە هەواڵ و داستانی موسات بۆ باس دەكەین، هەواڵ وداستانی گەلانی پێشینت- یەك لەدوای یەك- بۆ باس
دەكەین ﴿وقد آتیناك من لدنا ذكرا﴾ بێگومان لەلایەن خۆمانەوە بیرخەرەوەیەكمان (واتە: قورئان) بە تۆ بەخشیی.
﴿١٠٠ من أعرض عنه﴾ هەر كەسێك پشتی تێ بكاو گوێی نەداتێ ﴿فإنه یحمل یوم القیامة وزرا﴾ ئەوە بەڕاستی لە
ڕۆژی قیامەتدا كۆڵێ گوناح هەڵئەگرێ ﴿١٠١ خالدین فیه﴾ و
بە هەتایش بەكۆڵیەوە ئەبێ ﴿وساء لهم یوم القیامة حملا﴾
وە لەڕۆژیقیامەتدا بۆ ئەوانە، كۆڵ وبارێكی بێ فەڕو خراپ
هە یە.

**ڕۆژێك كە فوو بە شەیپووردا دەكرێ:**

﴿١٠٢ یوم ینفخ فی الصور﴾ باسی ئەو ڕۆژە بكە فوو بە
(شـەیپوور)دا ئـەكرێ ﴿ونحشـر المجـرمین یومئـذ زرقـا﴾ و
لەوڕۆژەدا تاوانباران كۆدەكەینەوە ،بەچاو شینی و كوێری.
(تەبەریی) ئەڵێ: لە تینوێتیدا ڕوویـان ڕەش دەبێ وچاویان
شین وەرئەگەڕێ ﴿١٠٣ یتخافتون بینهم إن لبثتم إلا عشرا﴾
لە ناوخۆیاندا بەسرتەو چپە بەیەكتر ئەڵێن: ئێوە هەر دە
ڕۆژێك لەدونیادا ماونەتەوە ﴿١٠٤ نحن اعلم بما یقولون﴾
ئێمە زاناترین بەوشتەی ئەوان لێی دەدوێن ﴿إذ یقول امثلهم
طریقة﴾ كـاتێ لەگشتیان ژیرتـر و زیرەكتریـان ئـەڵێ: ﴿إن
لبثتم إلا یوما﴾ ئێوە تەنها هەر ڕۆژێك ماونەتەوە، واتە:ئێش
وئازارەكەیان ئەوەندە زۆرە، مانەوەی دونیایان بە تەنیا
ڕۆژێك لێك ئەدەنەوە.

الجزء السادس عشر — سورة طه

كَذَٰلِكَ نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنۢبَآءِ مَا قَدْ سَبَقَ ۚ وَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ مِن لَّدُنَّا
ذِكْرًا ﴿٩٩﴾ مَّنْ أَعْرَضَ عَنْهُ فَإِنَّهُۥ يَحْمِلُ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وِزْرًا
﴿١٠٠﴾ خَٰلِدِينَ فِيهِ ۖ وَسَآءَ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ حِمْلًا ﴿١٠١﴾ يَوْمَ يُنفَخُ
فِى ٱلصُّورِ ۚ وَنَحْشُرُ ٱلْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ زُرْقًا ﴿١٠٢﴾ يَتَخَٰفَتُونَ
بَيْنَهُمْ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا عَشْرًا ﴿١٠٣﴾ نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ إِذْ يَقُولُ
أَمْثَلُهُمْ طَرِيقَةً إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا يَوْمًا ﴿١٠٤﴾ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْجِبَالِ
فَقُلْ يَنسِفُهَا رَبِّى نَسْفًا ﴿١٠٥﴾ فَيَذَرُهَا قَاعًا صَفْصَفًا ﴿١٠٦﴾
لَّا تَرَىٰ فِيهَا عِوَجًا وَلَآ أَمْتًا ﴿١٠٧﴾ يَوْمَئِذٍ يَتَّبِعُونَ ٱلدَّاعِىَ
لَا عِوَجَ لَهُۥ ۖ وَخَشَعَتِ ٱلْأَصْوَاتُ لِلرَّحْمَٰنِ فَلَا تَسْمَعُ إِلَّا هَمْسًا
﴿١٠٨﴾ يَوْمَئِذٍ لَّا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ وَرَضِىَ لَهُۥ
قَوْلًا ﴿١٠٩﴾ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ
عِلْمًا ﴿١١٠﴾ ۞ وَعَنَتِ ٱلْوُجُوهُ لِلْحَىِّ ٱلْقَيُّومِ ۖ وَقَدْ خَابَ مَنْ
حَمَلَ ظُلْمًا ﴿١١١﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَا
يَخَافُ ظُلْمًا وَلَا هَضْمًا ﴿١١٢﴾ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَٰهُ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا
وَصَرَّفْنَا فِيهِ مِنَ ٱلْوَعِيدِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ أَوْ يُحْدِثُ لَهُمْ ذِكْرًا ﴿١١٣﴾

٣١٩

**چیاكان دەهاڕدرێن و، زەوییش دەبێتە دەشتێكی كاكی بەكاكی:**

﴿١٠٥ ویسألونك عن الجبال﴾ لەبارەی كێوەكانەوە لێت دەپرسن: ئاخۆ لە ڕۆژی قیامەتدا چییان لێ دێت؟ ﴿فقل
ینسفها ربی نسفا﴾ لە وەڵامدا بڵێ: پەروەردگارم لەجێگەی خۆیاندا هەڵیان ئەكەنێ، بەڵام چۆن هەڵكەندنێ!
وردوخاشاكیان ئەكا و بەبایان دەكا ﴿١٠٦ فیذرها قاعا صفصفا﴾ شوێنەكەشیان دەكاتە دەشتێكی ساف و پان
وكاكیبە كاكی، وەك هەر هیچی تیا نەبووبێ ﴿١٠٧ لا ترى فیها عوجا ولا امتا﴾ هیچ خواریی‌و ناڕێكی وبەرزی و
نزمی تیا نابینی، هەمووی یەك پارچە ئەبێتەوە ﴿١٠٨ یومئذ یتبعون الداعی لا عوج له﴾ جا لەو ڕۆژەدا هەموو
خەڵكی دوای دەنگی جاڕچی(ئیسرافیل) ئەكەون، كە هیچ وەرچەرخان و لادانێك نیە لێی ﴿وخشعت الأصوات

للرحمن﴾ و هەموو خەڵکی لەبەر خوای بەخشندە دەنگیان نەوی دەبێ ﴿فلا تسمع إلا همسا﴾ دەنگی ژێر لێوو چپەچپ و ئەسپایی نەبێ، هیچ شتێ تر نابیسی.

**شەفاعەت و پاداش و تۆڵە:**

﴿١٠٩ یومئذ لا تنفع الشفاعة إلا من اذن له الرحمن﴾ لەو رۆژەدا تکاو لاڵانەوە لای خوا هیچ سوود نابەخشێ، مەگەر لە کەسێك خوای بەخشندە خۆی مۆڵەتی پێدابێ شەفاعەت بکا ﴿ورضي له قولا﴾ وتارو قسەکەشی پەسەند بکا. لە فەرموودەیەکی (متفق علیه) پێیدا هاتووە: ((آتی تحت العرش فأخر لله ساجداً، ویفتح علي بمحامد لا أحصیها الآن، فیدعني ما یشاءالله أن یَدَعَني، ثم یقول: یا محمد! إرفع رأسك، وقل یُسمع، واشفع تُشَفع. قال: فَیَحُد لي حَداً، فأدخلهم الجنة، ثم أعود)).فذکر اربع مرات). واتە: دێمە بن عەرش، ئەوسا لەوێ سوژدە دەبەم بۆ خوا، پاشان دەرگای گشت حەمدو سوپاسێکم لێ ئەکرێتەوە، کەبۆم نازمێردرێ، بۆ دوایش خوا خۆی چەندەی ئارەزووبوو ئەوەندە ئەمهێڵێتەوە، ئەوجا ئەڵێ: موحەممەد! سەرت بەرزەوەکە، دەبڵێ گوێت بۆ ئەگیردرێ، شەفاعەت بکە، لێت قبوڵ دەکرێ، فەرمووی: ئەوسا سنورێکم بۆ دادەنرێ، جا ئەو (چاکانە) دەبەمە بەهەشتەوە، دیسانەوە هەر دێمەوە بۆ تکاو شەفاعەت. پێغەمبەرﷺ چوار جار ئەو وتەیەی دووبارە کردەوە. ﴿١١٠ یعلم ما بین أیدیهم وما خلفهم﴾ خوابە هەموو ئەوشتانە دەزانێت کە ئەوان پێشیان خستووە وکردویانە لە دونیاودا، وەهەروەها بەوشتانەش چاك دەزانێت کە لەرۆژی دواییدا چاوەرێیانە، واتە: ئاگای لە هەمووشتێکیانە ﴿ولا یحیطون به علما﴾ ئەوان بەزانین عیلم ناتوانن دەورە بدەن بە بەرێوەبردن و حیکمەتی خوا ﴿١١١ وعنت الوجوه للحی القیوم﴾ وە هەموو دەموچاوو روخسارەکان لەو رۆژەدا لەئاستی ئەو خوایەی کە هەمیشە زیندووە و هەرگیز نامرێ و راگیرکەری هەموو بوونەوەرە لارە ملو سەرنەویی و ملکەچن ﴿وقد خاب من حمل ظلما﴾ وە بێگومان کێ ستەمی کردوهەڵیگرت زیانمەندو ناهومێدە ﴿١١٢ ومن یعمل من الصالحات و هو مؤمن﴾ هەر کەسیش ئاکاروکردەوەی چاك ئەنجام بدا لەهەمانکاتیشدا بڕواداریش بێت ﴿فلا یخاف ظلما ولا هضما﴾ جا نە لەوە دەترسێت، گوناهەکانی لەسەر زیاد بکرێن، وە نە لەوە چاکەکانی کەم بکرێنەوە.

**قورئان هات تا مەردم لە گوناح دوورەوە کەون:**

﴿١١٣ وکذلك انزلناه قرآنا عربیا﴾ وەهەر وەکو ئەو دابەزاندنەی ئایەتەکانی پێشێ، هەموو قورئانمان دابەزاند بەزمانی عەرەبی ﴿وصرفنا فیه من الوعید﴾ و چەندان جار هەڕەشەمان تیا دووبارە کردۆتەوە ﴿لعلهم یتقون﴾ بەشکو پارێز بکەن وخۆیان دووربگرن لە گوناهو تاوانکاریی و کاری ناپەسەند ﴿او یحدث لهم ذکرا﴾ وەیان بێداری و ئامۆژگارییەکیان بۆ بێنێ، یان بۆ ئەوەکە قورئان پەندو شەرەف و ئیعتیباریان بۆ نوێ بکاتەوە ﴿١١٤ فتعالی الله الملك الحق﴾ بڵندە خوای پاشا و دەسەڵاتداری بە هەق و راست ﴿ولا تعجل بالقرآن من قبل ان یقضی إلیك وحیه﴾ تۆش لەخوێندنەوەی قورئاندا ئەی محمد ﷺ پێش ئەوەی بەتەواوی وەحیی وسروش بکرێتە لات پەلەو تاڵوکەت نەبێ، پەیامبەر ﷺ ترسی هەبوو کەقورئانی لەبیر بچێتەوە، جالەبەرئەوە پەلەی دەکرد بۆ وەرگرتنی، وەك لە فەرموودەیەکی (متفق علیه)دا هاتووە. ﴿وقل رب زدنی علما﴾ بڵێ: ئەی پەروەردگارم! زانست و زانیارییم زیاد بك، واتە: بە قورئان وواتاکانی، بۆیە (ئەویش ﷺ) تا کۆچی دواییکرد هەر هەوڵی زیاد بوونی زانستی بوو.

**داستانی بابە ئادەم و ئیبلیس:**

ئینجا داستان و بەسەرهاتی ئادەمیش ﷺ دەست پێدەکاو، ئەفەرموێ: ﴿[١١٥] ولقد عهدنا إلى آدم من قبل﴾ بە
هەقیقەت هەر لە پێشەوە پەیمانمان لە ئادەم وەرگرت کە لەو درەختەیە نەخوا ﴿فنسي ولم نجد له عزما﴾ کەچی
لەبیری چووو، بەڵام لێبڕان و پلانێکی بەهێزمان لێنەدی بۆشکاندنی فەرمانەکەمان ﴿[١١٦] وإذ قلنا للملائكة اسجدوا
لآدم﴾ بیری ئەوکاتەش بکەوە بەفریشتەکانمان وت: کڕنوش بۆئادەم بەرن. (سەعید حەوا) لەتەفسیرە کەیدا ئەڵێت:
هەڵدەگرێ ئەم کڕنووشە، هەر کڕنووشی سەرخستنە سەرزەویی بێت، چونکە لەوسەردەمەدا ئادەم وەك رووگە
وابووە بۆیان ﴿فسجدوا إلا إبليس أبى﴾ ئەوانیش هەموو بەپەلە سوژدەیان بۆ برد، ئیبلیسی (شەیتان) نەبێت، ئەو
فیزی نەیهێناو سوژدەی نەبرد ﴿[١١٧] فقلنا يا آدم إن هذا
عدولك ولزوجك﴾ ئینجا وتمان: ئەی ئادەم! هۆشیار بە!
بەڕاستی ئەمە هەم نەیارو دوژمنی تۆو، هەم نەیارو
دووژمنی ژنەکەتە، جا هەرگیز بە گوێی نەکەی ﴿فلا
يخرجنكما من الجنة فتشقى﴾ وریابن لەم بەهەشتەتان
دەرنەکا، تووشی چەرمە سەرێ و نارەحەتی ژیان ببی ﴿[١١٨]
إن لك ان لا تجوع فيها ولا تعرى﴾ بێگومانبە هەتا لە
بەهەشتدابیت نەبرسی دەبی، نەرووت دەبی ﴿[١١٩] وانك لا
تظمأ فيها ولا تضحى﴾ وە تینوو دەبی تێیدا، نەخۆران گاز
﴿[١٢٠] فوسوس اليه الشيطان﴾ جا شەیتان دنەی داو
بەدگومانی خستە دڵیەوە ﴿قال يا آدم هل أدلك على شجرة
الخلد﴾ پێی وت: ئادەم! ئایادەتەوێت داری نەمرییت
ناشیان بدەم؟ واتە: دارێك ئەگەر لێی بخۆی هەرگیز
نەمرییت؟ ﴿وملك لا يبلى﴾ ودەسەڵات و سامانێکی بێ
براوەت شارەزا بکەم، کە هەرگیز تیا نەچێ؟ دیارە ئارەزووی
مانەوەی دونیا و دەسەڵات وسامان، ئەمانە دووصیفەتی
زگماکین و بە هەمیشە لەئادەمزاددا هەن، جا ئەگەر ئادەمیی

الجزء السادس عشر — سورة طه

فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلۡمَلِكُ ٱلۡحَقُّۗ وَلَا تَعۡجَلۡ بِٱلۡقُرۡءَانِ مِن قَبۡلِ أَن
يُقۡضَىٰٓ إِلَيۡكَ وَحۡيُهُۥۖ وَقُل رَّبِّ زِدۡنِي عِلۡمٗا ﴿١١٤﴾ وَلَقَدۡ عَهِدۡنَآ
إِلَىٰٓ ءَادَمَ مِن قَبۡلُ فَنَسِيَ وَلَمۡ نَجِدۡ لَهُۥ عَزۡمٗا ﴿١١٥﴾ وَإِذۡ قُلۡنَا
لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ أَبَىٰ
﴿١١٦﴾ فَقُلۡنَا يَٰٓـَٔادَمُ إِنَّ هَٰذَا عَدُوّٞ لَّكَ وَلِزَوۡجِكَ فَلَا يُخۡرِجَنَّكُمَا
مِنَ ٱلۡجَنَّةِ فَتَشۡقَىٰٓ ﴿١١٧﴾ إِنَّ لَكَ أَلَّا تَجُوعَ فِيهَا وَلَا تَعۡرَىٰ ﴿١١٨﴾
وَأَنَّكَ لَا تَظۡمَؤُاْ فِيهَا وَلَا تَضۡحَىٰ ﴿١١٩﴾ فَوَسۡوَسَ إِلَيۡهِ
ٱلشَّيۡطَٰنُ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ هَلۡ أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ ٱلۡخُلۡدِ وَمُلۡكٖ
لَّا يَبۡلَىٰ ﴿١٢٠﴾ فَأَكَلَا مِنۡهَا فَبَدَتۡ لَهُمَا سَوۡءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا
يَخۡصِفَانِ عَلَيۡهِمَا مِن وَرَقِ ٱلۡجَنَّةِۚ وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ ﴿١٢١﴾
ثُمَّ ٱجۡتَبَٰهُ رَبُّهُۥ فَتَابَ عَلَيۡهِ وَهَدَىٰ ﴿١٢٢﴾ قَالَ ٱهۡبِطَا مِنۡهَا
جَمِيعَۢاۖ بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوّٞۖ فَإِمَّا يَأۡتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدٗى
فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشۡقَىٰ ﴿١٢٣﴾ وَمَنۡ أَعۡرَضَ عَن
ذِكۡرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةٗ ضَنكٗا وَنَحۡشُرُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ
أَعۡمَىٰ ﴿١٢٤﴾ قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرۡتَنِيٓ أَعۡمَىٰ وَقَدۡ كُنتُ بَصِيرٗا ﴿١٢٥﴾

٣٢٠ — قال كذلك

فریای خۆی نەکەوێ، ئەوا بە زوویی فریو ئەدرێ.. هەر بۆیەش گەلێ جار زۆربەی سەرۆك وقیادەکان لەو
سۆنگەیەوە لێیان دەقەومێ و سەریان لێ تێك دەچێ ﴿[١٢١] فأكلا منها﴾ شەیتان هەر کۆڵی لێنەدان تا دەرەنجام ئادەم
و حەوا —هەردوو— لە بەری درەختەکەیان خوارد کە قەدەغە بوو لێیان ﴿فبدت لهما سوآتهما﴾ ئیتر جل و بەرگی
بەهەشتیان لەبەرا نەماو رووت و قوت مانەوەو شەرمی خۆیان بۆ دەرکەوت ﴿وطفقا يخصفان عليهما من ورق
الجنة﴾ بەپەلە خەریکبوون و هەوڵیاندا کە بەگەڵای درەختەکانی بەهەشت عەورەتیان داپۆشن پاش ئەوە کە
هەستیان بەشەرمەزاریی کرد. وادیارە ئەودرەختە ماددەیەکی تیابووبێ کە ئارەزووی ژن ومێردی بوروژێنێ، هەر
بۆیەش لەسەرەتاوە ڕێگری لێکردن، خوایش باشتر ئەزانێ ﴿وعصى آدم ربه فغوى﴾ ئابەم شێوەیە ئادەم سەرپێچی
لە پەروەردگاری خۆیکردو لەدرەختەکەی خواردو لەرێ دەرچوو، جا لە تۆڵەی ئەوەدا خراپیە ئەم دونیای پڕ لە

خەفەت و ئێش وئازارەیە ﴿[١٢٢] ثم اجتباه ربه فتاب علیه﴾ پاشان پەروەردگاریی هەڵیبژارد بۆ پێغەمبەریێتی و لەخۆیی نزیك خستەوەو تەوبەشی لێوەرگرت ﴿وهدی﴾ و شارەزا و ڕێنمایی کرد، بۆپاڕانەوەو داوا کردنی لێخۆشبوون.

**ئادەم لەبەهەشتەوە بۆ سەر زەویی:**

﴿[١٢٣] قال اهبطا منها جمیعا﴾ خوای گەورە فەرمووی: هەردووکتان (ئادەم وحەوا) لەبەهەشت سەربەرەو ژێر دابەزنە خواریْ ﴿بعضکم لبعض عدو﴾ سەرەنجامیش هەندێکتان دوژمنی هەندێکتان بن، ئێوە نەیارو دوژمنی شەیتان دەبن، ئەویش نەیارودوژمنی ئێوە دەبیْ ﴿فإما یاتینکم منی هدی﴾ جا ئەگەر لەمنەوە ڕێنمایەکتان بۆ هات ﴿فمن تبع هدای فلا یضل ولا یشقی﴾ ئەوسا ئەوەی پەیڕەوی لەڕێنمایی منی کرد، ئیتر نەلە دونیادا گومڕا ئەبیْ و، نەلەقیامەتیشدا بەدبەخت ئەبیْ بەسزا. باشترین راوبۆچوون سەبارەت بەوحاڵەتەی بەسەر ئادەمدا هات ئەمەیە کە دەڵێت: ئەو بەسەرهاتەی (ئادەم) پێشبوونی بەپێغەمبەر بووە، بەپێی ئایەتی: (ثم اجتباه ربه فتاب علیه وهدی). ﴿[١٢٤] ومن اعرض عن ذکری﴾ وهەرکەسێکیش لەو قورئانەیەم رووەرگێڕیْ ﴿فإن له معیشة ضنکا﴾ ئەوە بێگومان ژیانێکی سەختی دەبیْ، هەرچەند خاوەنی دونیایش بیْ. بەڵیْ مرۆ هەرکە پەیوەندی لە خوا بچڕا دڵی تەنگە، بچووکە، بیْئارامە، هەرگیز تێرنابیْ ﴿ونحشره یوم القیامة أعمی﴾ وە لەڕۆژی قیامەتیشدا بەکوێریی حەشرو دادگایی ئەکەین ﴿[١٢٥] قال رب لم حشرتنی اعمی﴾ ئەویش لەو هەڵوێستەدا ئەڵیْ: ئەی پەروەردگارم! بۆچی منت بەکوێری حەشرکرد؟ ﴿وقد کنت بصیرا﴾ خۆمن لەدونیادا چاوم ساغ بوو و بینا بووم ﴿[١٢٦] قال کذلك﴾ خوا لەوەلامدا دەفەرمویْ: کارهەروایە ﴿اتتك آیاتنا فنسیتها﴾ تۆ بەڵگەو ئایەتە ڕۆشنەکانی ئێمەت بۆهات لەبیرت کرد ﴿کذلك الیوم تنسی﴾ ئاوائەمڕۆش تۆش لەبیر دەچیت، پشت گوێت ئەخەین وفەرامۆشت ئەکەین ﴿[١٢٧] وکذلك نجزی من اسرف ولم یؤمن بآیات ربه﴾ هەرئابەوجۆرەیە تۆڵە ئەکەینەوە لەو کەسەی سەرپێچی وزیادە ڕەویی کردبیْ وبڕوای بەئایەتەکانی پەروەردگاری نەهێنابیْ ﴿ولعذاب الآخرة أشد و ابقی﴾ وە بێگومان سزاو جەزرەبەی ئەو ڕۆژەکەیتریش توندترو بەردەوامترە. وەك پێغەمبەر ﷺ بەنەفرین کارانی فەرموو: ((إن عذاب الدنیا أهون من عذاب الآخرة)) موسلیم. واتە: بێگومان سزای ئەم دونیایە، گەلیْ لەسزای دوا ڕۆژ سووکترە.

ٱلْجُزْءُ ٱلسَّادِسَ عَشَرَ — سُورَةُ طه

قَالَ كَذَٰلِكَ أَتَتْكَ ءَايَٰتُنَا فَنَسِيتَهَا ۖ وَكَذَٰلِكَ ٱلْيَوْمَ تُنسَىٰ ﴿١٢٦﴾ وَكَذَٰلِكَ
نَجْزِى مَنْ أَسْرَفَ وَلَمْ يُؤْمِنۢ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ ۚ وَلَعَذَابُ ٱلْءَاخِرَةِ أَشَدُّ
وَأَبْقَىٰٓ ﴿١٢٧﴾ أَفَلَمْ يَهْدِ لَهُمْ كَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّنَ ٱلْقُرُونِ يَمْشُونَ
فِى مَسَٰكِنِهِمْ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلنُّهَىٰ ﴿١٢٨﴾ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ
سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَكَانَ لِزَامًا وَأَجَلٌ مُّسَمًّى ﴿١٢٩﴾ فَٱصْبِرْ عَلَىٰ
مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ ٱلشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا ۖ
وَمِنْ ءَانَآئِ ٱلَّيْلِ فَسَبِّحْ وَأَطْرَافَ ٱلنَّهَارِ لَعَلَّكَ تَرْضَىٰ ﴿١٣٠﴾ وَلَا
تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ زَهْرَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا
لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ ۚ وَرِزْقُ رَبِّكَ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ ﴿١٣١﴾ وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِٱلصَّلَوٰةِ
وَٱصْطَبِرْ عَلَيْهَا ۖ لَا نَسْـَٔلُكَ رِزْقًا ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُكَ ۗ وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلتَّقْوَىٰ
﴿١٣٢﴾ وَقَالُوا۟ لَوْلَا يَأْتِينَا بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّهِۦٓ ۚ أَوَلَمْ تَأْتِهِم بَيِّنَةُ مَا فِى
ٱلصُّحُفِ ٱلْأُولَىٰ ﴿١٣٣﴾ وَلَوْ أَنَّآ أَهْلَكْنَٰهُم بِعَذَابٍ مِّن قَبْلِهِۦ
لَقَالُوا۟ رَبَّنَا لَوْلَآ أَرْسَلْتَ إِلَيْنَا رَسُولًا فَنَتَّبِعَ ءَايَٰتِكَ مِن
قَبْلِ أَن نَّذِلَّ وَنَخْزَىٰ ﴿١٣٤﴾ قُلْ كُلٌّ مُّتَرَبِّصٌ فَتَرَبَّصُوا۟ ۖ
فَسَتَعْلَمُونَ مَنْ أَصْحَٰبُ ٱلصِّرَٰطِ ٱلسَّوِىِّ وَمَنِ ٱهْتَدَىٰ ﴿١٣٥﴾

٣٢١

## لەقڕبوونی گەلانی زوو عیبرەت گرن:

﴿١٢٨ افلم يهد لهم كم اهلكنا قبلهم من القرون﴾ ئینجا پێش هاتنی سزای دوا ڕۆژ ،ئەنجامی یاخیبوونەکەیان نیشان ئەداو ئەفەرموێ: ئاخۆ بۆیان ڕوون نەبۆتەوە خەڵکانێکی زۆرمان پێش ئەمان لەناوبرد؟ ﴿يمشون في مساكنهم﴾ کەئێستا ئەمان لەجێگا وێرانەکانی ئەواندا هاتووچۆ ئەکەن وشوێنەواری سزاشمان دەبینن؟ ﴿إن في ذلك لآيات لأولي النهى﴾ بە ڕاستی ئالەو لەناوبردنەدا گەلێك بەڵگەو نیشانە هەیە بۆ ئەوانەی ژیرن وخاوەن ئاوەزن ﴿١٢٩ ولولا كلمة سبقت من ربك لكان لزاما وأجل مسمى﴾ وەئەگەر بەڵێنێك پێش نەکەوتبا لەلایەن پەروەردگارتەوە تاکاتێکی دیاریکراو بۆسزانەدانیان، هەرئێستا لەناوبردنیان پێویست و مسۆگەر دەبوو ﴿١٣٠ فاصبر على مايقولون﴾ جاکەواتە لەسەرئەوەی ئەوان ئەیڵێن خۆڕاگربە ﴿وسبح بحمد ربك قبل طلوع الشمس﴾ پێش خۆرهەڵاتن هەرپاك وخاوێنی و تەسبیحاتی پەروەردگارت ڕابگرەو سوپاسگوزاریی ئەوبە ﴿وقبل غروبها﴾ وە لەپێش ئاوا بوونیشدا. واتە: نوێژەکانی نیوەڕۆ وعەسرو شێوان بکە، لەفەرموودەیەکی(متفق عليه)دا هاتووە: کە (جەریری عبداللەی بەجەلی) دەڵێ: ڕۆژێ لای پێغەمبەر ﷺ دانیشتبووین، ئەوجا سەیرێکی مانگە چواردە شەوەکەی کردو فەرمووی: ((إنكم سترون ربكم كما ترون هذا القمر، لا تُضامون في رؤيته، فإن استطعتم الا تُغْلَبُوا على صلاة قبل طلوع الشمس وقبل غروبها، فأفعلوا)) پاشان ئەم ئایەتەی (وسبح بحمد ربك..)ی خوێندەوە ﴿ومن آناء الليل فسبح﴾ وە لە ساتەکانی شەویشدا هەرتەسبیحات ویادی خوابکە، واتە: (نوێژی شێوان وعیشا) ئەنجام بدە ﴿وأطراف النهار﴾ وە لەهەردوو تەرەفەکانی ڕۆژیشدا هەروا ﴿لعلك ترضى﴾ بەشکو بەئاواتت بگەیت و خۆشنودو ڕازیش بیت بەبڕیارەکانی خواو دڵت ئارام بگرێ لەسەرکارەکەت.

## چاو لەوە مەدە داومانە بە خوانەناسان:

﴿١٣١ ولاتمدن عينيك إلى ما متعنا به أزواجا منهم زهرة الحياة الدنيا﴾ تۆ چاو لەوماڵ وسامانە مەبڕە ئەی پێغەمبەر ﷺ! ئێمە بەتاقمێك لە بێباوەڕەکانمان داوە، ئەوە هەر شکۆفەو خۆشی ژیانی ئەم دنیایەو کەم دەوامە ﴿لنفتنهم فيه﴾ چونکە هەرویستومانە بەوماڵ وسامان وشکۆفەو جوانی دنیایە، تاقییان بکەینەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لەرزق و رۆزی ئەم دنیایە لە هەمووشت پتر دەترسم کەچەواشەتان بکاو لەخشتەتان بەرێ. ئیبن ئەبی حاتەم ﴿ورزق ربك خير وأبقى﴾ بێگومان ڕزق وڕۆزی پەروەردگاری تۆ لەبەهەشتدا باشترەو پایەدار ترە لەوەی ئەوان ئەمڕۆ لەبەر دەسیاندایە ﴿١٣٢ وامر اهلك بالصلاة﴾ ئەی پێغەمبەر!ﷺ ئەی ئیماندار! بەخاوو خێزان و کەس وکارت فەرمان بە نوێژ بدە ﴿واصطبر عليها﴾ و خۆیشت لەسەر ئەنجامدانی ڕابهێنەو، هەرگیز وازی لێمەهێنەو دەوامت هەبێ, بەڵێ پێویستە مرۆڤی موسڵمان هەردەم هەوڵ بدات کە: نێو ماڵەکەی بکاتە ماڵی موسڵمان و، تەواوی تاکەتاکەی خانەوادەکەی هەرلەخوا ڕووبکات، بۆیە خوا لەجێیەکی تردا دەفەرموێ: (ياأيهاالذين آمنوا قوا أنفسكم وأهليكم نارا). ﴿لا نسألك رزقا﴾ داوای ڕزق وڕۆزیی لەتۆ ناکەین ﴿نحن نرزقك﴾ بەڵکو ئێمە خۆمان ڕزق و ڕۆزیی و بژێویی بەتۆ ئەدەین، جاکەوایە ئەوەندەش بەکاروباری ڕزق وڕۆزییەوەخۆت سەرگەرم مەکە ﴿و العاقبة للتقوى﴾ سەرەنجام و پاشەڕۆژی چاك وپیرۆزیش، تەنها هەربۆخەڵکانی پارێزکارو بە تەقوایە، ئەوانەی سنوورەکانی خوا دەپارێزن، پێغەمبەری ئازیزو ڕێزدارمان دەفەرموێ: ((يقول الله تعالى: يابن آدم تَفَرَّغْ لعبادتي، امْلأْ صدرك غِنيً، وأسُدَّ فقرك، وإن لم تفعل، ملأتُ صدرَك شُغْلاً، ولم أسُدَّ فقرَك)) ترمزیی.

**موشریکان - وێڕای قورئان- نیشانەیان دەوێ:**

﴿[١٣٣] وقالوا لولا یأتینا بآیة من ربه﴾ بێ باوەڕانی مەککەش گوتیان: بۆچی موحەممەد ﷺ لەلایەن پەروەردگار یەوە ئایەت و بەڵگەیەکمان بۆ ناهێنێ لەسەر پەیامبەرێتی خۆی، دیارە قورئان بەبەڵگە دانانێن! ﴿أو لم تأتهم بینة ما فی الصحف الأولی﴾ ئایا ئەوان بەڵگەی ئاشکرایان بۆ نەهات، کەلە پەڕاوە پیشووەکاندا هەبووو بڕواشیان نەهێنا،واتە: ئەمانیش هەر شتێکیان بۆبێت ، ئەنجامەکەی وەك ئەنجامی ئەو پێشوانە دەبێ، دەسا ئیتر داوای بەڵگەی چی دەکەن؟ ئیمامی(بوخاریی وموسلیم) ریوایەت دەکەن کە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((ما من نبی إلا وقد أوتی من الآیات ما آمن علی مثله البشر، وإنما کان الذی أوتیته وحیاً اوحاه الله الی, فأرجو أن أکون أکثرهم تابعاً یوم القیامة)).واتە: هەموو پێغەمبەرێك ئەوەندە موعجیزەی پێدراوە کەخەڵکەکەی بڕوای پێ بکەن, بەڵام ئەوەی بەمن دراوە، هەرئەوەیە خوا بە وەحی بۆمی دەنێرێ ئومێدەوارم کەپەیڕەوانی من لەرۆژی قیامەتدا لەهی هەموان زیاتر بێ. ﴿[١٣٤] ولو أنا أهلکناهم بعذاب من قبله﴾ خۆ ئەگەر ئێمە پێش هاتنی ئەم قورئانە وپەیامبەرەیە, ئەوانمان بەسزایەك لەناوبردبا ﴿لقالوا ربنا لولا أرسلت إلینا رسولا﴾ لە دوارۆژدا بۆیان هەبوو بڵێن و دەشیان گوت: ئەی پەروەردگاری ئێمە! بۆچی لە دونیادا پەیامبەرێکت بۆنەناردین ﴿فنتبع آیاتك من قبل أن نذل ونخزی﴾ تا پەیڕەوی بەرنامەو ئایەتەکانی تۆبکەین پێش ئەوەی ئەمڕۆ ئاوا ریسواو سەرشۆڕبین ﴿[١٣٥] قل کل متربص فتربصوا﴾ ئەی موحەممەد! ﷺ بەخوانەناسان بڵێ: هەمووومان (ئێمەو ئێوە) چاوەڕوانین: پاشەرۆژی چاك بۆکام لامان بێت؟ ﴿فستعلمون من أصحاب الصراط السوی﴾ بێگومان کە لێتان حاڵی بوو، چاك ئەزانن چ کەسانێك خاوەنی رێگەی راستن ﴿ومن اهتدی﴾ وچ کەسێکیش رێنوێن بووە؟ جاکەوایە تۆش هەر سوور بە لەسەر گەیاندنی پەیامەکەی خۆت و، وەك مووساش ئارامت بێ، پاشەرۆژیش هەربۆ تۆ ئەبێ. وەك لەجێگایەکی تردا ئەفەرموێ: (وسوف یعلمون حین یرون العذاب من أضل سبیلا) ٢٥/٤٢، یان دەفەرموێ: (سیعلمون غدا من الکذاب الأشر) ٥٤/٢٦.

کۆتایی تەفسیری سورەتی تاها.

کۆتایی جزمی شازدیەم

و لله الحمد والمنة

*** *** ***

## ٢١- سوورەتی ( ئەنبیاء )ـە

## مەککەییەو (١١٢) ئایەتە

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

ئەم سوورەتە وەك هاووێنەکانی خۆی باسی خاڵە بنەڕەتییەکان: بیرو باوەڕ، پەیام، پەیامبەرێتی، زیندوو بوونەوە، پاداشت و تۆڵە دەکا.. هەریەك لەوانەش بەچەند دیاردەیەکی ئەم بوونەوەرەیە دەسەلمێنێ و بەهێزدەکات، بەئاسمان و زەویی و، شاخ و کێوەکان و، بەرزایی و نزمییاندا ئەتگێڕێ.. پاشان ڕۆژو خۆرو مانگ.. جابۆچەسپاندنیی یەکتاپەرستیی ئایەتی: (لوکان فیهما آلهة إلا الله لفسدتا) دێنێ، سەرچاوەی هەموو بوونەوەریش بەئایەتی: (وجعلنا من الماء کل شئ حی) یەکدەخات، دەرەنجام وکۆتایی بوونەوەرو، هەموو زیندەوەرەکانیش بەئایەتی: (کل نفس ذائقة الموت) دێت، جابۆکوێ دەگەڕێنەوە: (وإلینا یرجعون)، پاشان کاری گشت پەیامبەران و یەك جۆریی کارەکانیان، ئەگەرچی ماوەی نێوانیشیان زۆر بووبێت: (وما أرسلنا من قبلك من رسول إلا نوحی إلیه

أنه لا إله إلا أنا فاعبدون) هاوکات لەگەڵ باسکردنی نەخشەی خوای گەورە کە پەیامبەران هەموو لە پیاوان دەبن: (وما أرسلنا قبلك إلا رجالا نوحي إليهم). زنجیرەی پەیامبەرانیش هەریەکەیان کاری ئەویتر تەواو دەکات. بۆیە ئەم سوورەتەیش بەپەلەو بەکورتە هەندێکیان دێنێ وەك:(نوح، موسا, هاروون، لووت، ئیسماعیل، ئیدریس، زیکیفل، زەنوون، زەکەریاو یەحیاو عیسا، سەلامی خوایان لەسەربێ، هەندێکی دیکەشیان بەدرێژیی، وەك داستانی (ئیبراهیم و داودو سولەیمان)، سەلامی خوایان لێبێ.

کۆتاییشی بەوە دێ کە پاشەڕۆژ – هەرچەندە ئەمڕۆ دنیای راستیی وراستگۆیان تاریك بێت – هەر بۆڕاستیی و راستانە،وەکو دەفەرموێ: (بل نقذف بالحق على الباطل فيدمغه فإذا هو زاهق)یان دەفەرموێ: (ولقد كتبنا فى الزبور من بعد الذكر أن الأرض يرثها عبادى الصالحون). لە گەورەیی ومەزنیی ئەم سوورەتی(ئە نبیاء)یەدا ئەم فەرموودەهاتووە کەدەفەرموێ: ((عن عبد الله قال: بنو إسرائيل، والكهف، ومريم، وطه، والأنبياء،هُنَّ من العتاق الأول، وهن من تلادى، أى: مما حفظ قديما)) بوخاریی. (ومراد ابن مسعود: أنهن من أول ما تعلم من القرآن، وأن لهن فضلا لما فيهن من القصص وأخبار الأنبياء). واتە: عەبدوڵلا دەڵێ: سوورەتی بەنی ئیسرائیل(ئیسراء)، کەهف، تاها، ئەنبیا،ئەمانە لەو سوورەتانەن کە هەر لەسەرەتاوە وەرگیراون و پارێزراون و فەزڵی تایبەتیی خۆیانیان هەیە.

الجزء السابع عشر | سورة الأنبياء

سُورَةُ الأَنبِيَاءِ

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

اقْتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمْ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ مُّعْرِضُونَ (١)
مَا يَأْتِيهِم مِّن ذِكْرٍ مِّن رَّبِّهِم مُّحْدَثٍ إِلَّا اسْتَمَعُوهُ وَهُمْ
يَلْعَبُونَ (٢) لَاهِيَةً قُلُوبُهُمْ وَأَسَرُّوا النَّجْوَى الَّذِينَ ظَلَمُوا
هَلْ هَٰذَا إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ أَفَتَأْتُونَ السِّحْرَ وَأَنتُمْ
تُبْصِرُونَ (٣) قَالَ رَبِّي يَعْلَمُ الْقَوْلَ فِي السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ
وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ (٤) بَلْ قَالُوا أَضْغَاثُ أَحْلَامٍ بَلِ
افْتَرَاهُ بَلْ هُوَ شَاعِرٌ فَلْيَأْتِنَا بِآيَةٍ كَمَا أُرْسِلَ الْأَوَّلُونَ
(٥) مَا آمَنَتْ قَبْلَهُم مِّن قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَاهَا أَفَهُمْ يُؤْمِنُونَ
(٦) وَمَا أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ إِلَّا رِجَالًا نُّوحِي إِلَيْهِمْ فَاسْأَلُوا أَهْلَ
الذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ (٧) وَمَا جَعَلْنَاهُمْ جَسَدًا
لَّا يَأْكُلُونَ الطَّعَامَ وَمَا كَانُوا خَالِدِينَ (٨) ثُمَّ صَدَقْنَاهُمُ
الْوَعْدَ فَأَنجَيْنَاهُمْ وَمَن نَّشَاءُ وَأَهْلَكْنَا الْمُسْرِفِينَ (٩)
لَقَدْ أَنزَلْنَا إِلَيْكُمْ كِتَابًا فِيهِ ذِكْرُكُمْ أَفَلَا تَعْقِلُونَ (١٠)

٣٢٢ وَكَمْ قَصَمْنَا

**قیامەت بەڕاسەری خەڵکەوەیە :**

﴿بسم الله الرحمن الرحيم * [1] اقترب للناس حسابهم﴾

کاتی حیساب و لێپرسینەوەی مەردم لە کاروکردەوەیان نزیك بۆتەوە ﴿وهم فى غفلة معرضون﴾ وئەوانیش لە خەفڵەتان لەو ڕۆژە, رووەدسووڕێنن و گوێیان لێ نیەو، لەوە داناچڵەکێن کە خوا پێیان ئەکات!، لەئایەتێکی تردا هاتووە: (اتى أمرالله فلا تستعجلوه..) یان دەفەرموێ:(اقتربت الساعة وانشق القمر.وإن يروا آية يعرضوا..) ﴿[2] ما يأتيهم من ذكر من ربهم محدث إلا استمعوه﴾ هەربەش و پەندێکی تازەی قورئانیان لەلایەن پەروەردگاریانەوە بۆبێت، گوێیبۆ ڕائەگرن،هەتابزانن چیە؟ ﴿وهم يلعبون﴾ کەچی لەگەڵ ئەوەشدا گورج دەکەونە گاڵتەو گەپ پێی ﴿[3] لاهية قلوبهم﴾ ودڵیان خافڵ و بێ ئاگایە، تا بیرێکی لێ بکەنەوەو بەخۆیاندا بچنەوە. بەڵێ.. دڵەمردووەکان لەکاتی پێویستدا ئاگایان لەخۆ نیەو، هەر سەرگەرمن بەگاڵتەو گەمەوە ﴿وأسروا النجوى الذين ظلموا﴾ ئەوانەش ستەمیان کرد و لەسنوور دەرچوون، لەنێوخۆیاندابەسرتە سرت دەڵێن: ﴿هل هذا إلا بشر مثلكم﴾ ئایا ئەم (موحەممەد)ـە ﷺ کەداوای پەیامبەرێتی دەکات، ئەویش هەر وەکو ئێوە مرۆڤ نیە، وا ئێستا داوای پەیامبەرێتی دەکات؟! ﴿افتأتون السحر وانتم تبصرون﴾ دە ئایا ئێوە دێنەلای جادووودەسخەڕۆی جادوودەبن و،لەحاڵێکا چاوتان هەیەو دەبینن!واتە:ئەر پەیرەوی لێ بکەن،وەك

ئەوەیەپەیڕەویتان لەسیحر کردبێ، بەڵێئەوانە پێیان وابوو کە پەیامبەر هەر دەبێ فریشتە بێت، ئیتر پاش ئەوە ئەرکەسێك داوای پەیامبەرێتی بکات و موجیزەی خۆیشی بێنێ ئەوان هەر بەجادووی دائەنێن، جا کەوایە – وەك خۆیان ئەڵێن– چۆن ئەبێ ئامادەی جادوو بین؟ ﴿[٤] قال ربی یعلم القول فی السماء والأرض﴾ پەیامبەر فەرمووی: پەروەردگاری من لەهەموو قسەو وتەیەك چ لەئاسماندا، چ لەزەوییدا بکرێ بەئاگایەو ئەزانێ ﴿وهو السمیع العلیم﴾ هەر ئەویشە بیسندەو زانا هەرچی ئەوترێ چ بەنهێنی و، چ بە ئاشکرا، ئەو هەر ئەیزانێ و ئەیبیسێ ﴿[٥] بل قالوا اضغاث أحلام﴾ نە هەر ئەوەندە بەرامبەر بە قورئان بڵێن، بەڵکو گوتیان: ئەم قورئانە هەر تێکەو لێکەی خەوی پڕوو پووچ و خەونە درۆزنەیە ﴿بل افتراه﴾ نەخێر، بەڵکو موحەممەد ﷺ خۆی هەڵیبەستووە! ﴿بل هو شاعر﴾ بەڵکودەشبێ شاعیرو هۆنیارێك بێ و، خۆی ئەم قورئانەی هۆنیبێتەوە ﴿فلیأتنا بآیة کما أرسل الأولون﴾ جا ئەگەر راست ئەکاو پێغەمبەرە, دەبا بەڵگەو نیشانەیەکمان غەیرەز قورئان بۆ بێنێ، لە چەشنی موجیزەی پێغەمبەرانی پێشوو, ئەوان بەبەڵگەو نیشانەوە نێردران ﴿[٦] ما آمنت قبلهم من قریة أهلکناها﴾ پێش ئەمانیش ئەو شارو گوندانە (بەنموونە هۆزی صالح..)"کە داوای بەڵگەیان دەکرد , بەڵگەیان بۆ هات و باوەڕیان نەهێنا! ئێمەش قڕمان کردن ﴿أفهم یؤمنون﴾ ئاخۆ ئەمان "کە داوای هێنانی بەڵگە ئەکەن" بڕوا دەکەن بەئایەت و موجیزەکانمان ئەگەر بەچاو دیتنیان، دیارە ئەمانیش هەر وەك ئەوان بڕوا ناهێنن، جا ئیتر ناترسن لەناو ببرێن؟.

**بەدەر لە ئادەمزاد پێغەمبەر نەبووە:**

﴿[٧] وما ارسلنا قبلك إلا رجالا نوحی إلیهم﴾ بۆ چ ئەوانە لەوە سەریان سوڕئەمێنێ کە تۆ پەیامبەربی و ئادەمیزادیش بیت؟! خۆ ئێمە ئەوپێغەمبەرانەش لە پێش تۆوە سروشمان بۆ ناردن, هەموو لەمێران ودەستەی پیاوان بوون، وەك ئەفەرموێ: (وما ارسلنا من قبلك إلا رجالا نوحی إلیهم من أهل القری)١٠٩/١٢، یا دەفەرموێ: (قل ما کنت بدعا من الرسل)٩/٤٦. ﴿فاسألوا أهل الذکر إن کنتم لا تعلمون﴾ دەسا ئەگەر ئێوە نازانن و بڕوایش ناکەن، دەبڕۆن لەزاناکانی تەورات و ئینجیل بپرسن ﴿[٨] وما جعلناهم جسدا لا یأکلون الطعام﴾ ئێمە پەیامبەرانمان بەلەش و پەیکەرێك دروست نەکرد، تا وەك فریشتە خۆراك نەخۆن، وەك ئەم ئایەتەش ئەفەرموێ: (وما أرسلنا قبلك من المرسلین إلا انهم لیأکلون الطعام ویمشون فی الأسواق) ٢٠/٢٥. یان: (ما لهذا الرسول یأکل الطعام و یمشی فی الأسواق لولا أنزل إلیه ملك فیکون معه نذیرا)٧/٢٥. ﴿وماکانوا خالدین﴾ نەمریش نەبوون لە دونیادا، بەڵکو ماوەیەکی دیاریکراو ژیان، پاشان ئەوانیش مردن ﴿[٩] ثم صدقناهم الوعد﴾ لەپاشان راستمان لەگەڵ کردن و بەڵێنی خۆمانمان بۆ هێنانە جێ بەلەناوبردنی ستەمکاران ﴿فأنجیناهم ومن نشاء﴾ ئینجا بڕواداران و هەرکەسێکی دیکەش خۆمان ویستمان رزگار ببن, رزگارمان کردن ﴿وأهلکنا المسرفین﴾ وە لەسنوور دەرچووانیشمان ئەوانەی وا بڕوایان بەپەیامبەرەکانمان نەبوو فەوت وفەنا کرد.

**مەزنایەتی قورئان:**

﴿[١٠] لقد أنزلنا إلیکم کتابا فیه ذکرکم﴾ وا ئێمە کتێبێکی بەرێزو گەورەمان بۆ ئێوە نارد, باسی شەرەف و رێزی ئێوەشی تێدایە, بەتایبەت ئەو کەسەی پەیڕەوی لێ بکا و کاری پێ بکات ئەبێتە سالارو سەروەری هەردووجیهان، وەك ئەفەرموێ: (وإنه لذکر لك ولقومك وسوف تسئلون). ﴿أفلا تعقلون﴾ دە ئایاتێناگەن, تێنافکرێن لە ئایەتەکانمان، تا بەتوندی وەری بگرن وکاری پێبکەن؟ کەچی لەباتی ئەوەی بیپارێزن وببنە بالآگەردانی، لەگەڵیا ئەجەنگێن!! ﴿[١١] وکم قصمنا من قریة کانت ظالمة﴾ چەند گوندو شاریشمان تێکشکاند لەبەر ئەوەی کەخەڵکەکەی

ستەم کارو بتپەرست بوون ﴿وانشأنا بعدها قوما آخرین﴾ بە دوای ئەوانیشدا گەلانی ترمان لێدامەزراند ﴿[١٢] فلما احسوا بأسنا إذا هم منها یرکضون﴾ ئینجا هەر کە هەستییانکرد ویەقینیان پەیدا کردوو، بە چاوی سەریش دیتیان کەسزامان هاتە سەریان، ئیتر بە پەلە لە ئاوایی هەڵدەهاتن و رایاندەکرد ﴿لا ترکضوا وارجعوا إلی ما اترفتم فیه﴾ ئەوسا بە گاڵتەوە پێیان وترا: رامەکەن، بگەڕێنەوە سەرئەو خۆشگوزەرانییەی سەرگەرم ببوون تێیدا ﴿ومساکنکم لعلکم تسألون﴾ بۆجێگاو شوێن وکۆشك و خانوو بەرەکانی خۆتان، بەشکو پرسیارتان لێبکرێت، ئایا شوکرانە بژێربوونە لەبەرامبەر نیعمەتەکانی منەوە؟ دیارە ئیتر کاتی پرسیارو وەڵام نەماوەو بڕیاری تیاچوونیان دراوە، ئەم قسەو باسەیشیان (وەك قەتادە ئەڵێ) لە رووی گاڵتەولاقرتییەوە پێیاندەگوترێت ﴿[١٤] قالوا: یا ویلنا إنا کنا ظالمین﴾

ئەوجا کەزانیان کار لەکار ترازاوە وتیان: ئەی تیا چووی خۆمان! بێگومان ئێمە ستەمکار بووین "ئەمە تۆڵەی کارەکانی دنیامانە، بەڵام تازە لەدەستیان دەرچووە و، ئەم پێ لێنانەشیان هیچ کەڵکێکیان پێ نابەخشێ" ﴿[١٥] فما زالت تلك دعواهم﴾ ئیتر هەر ئەمە دوعایان بوو دەیانوت: (یا ویلنا إنا کنا ظالمین) ﴿حتی جعلناهم حصیدا خامدین﴾ تا هەموویانمان دروێنەکرد و بێ دەنگ وبێ ورتەمانەوە.

**بوونەوەرمان بۆ گەمە دروست نەکردووە:**

﴿[١٦] وما خلقنا السماء والأرض وما بینهما لاعبین﴾ خۆ ئێمە ئاسمان و زەویی و هەرچی لە نێوانیاندایە بەگەمە دروست نەکردووە، بەڵکو بۆئەوەیە کە ئەوان گەورەیی و عەدالەتی خوای پێ بدۆزنەوە، جا ئیتر ئەوان چۆن دەوێرن لاقرتی کەن؟! ﴿[١٧] لو اردنا ان نتخذ لهوا لاتخذناه من لدنا﴾ گریمان ئەگەر ئێمە ویستبامان لە هەموو: (ژن) بۆ خۆمان دابنێین لە شیاومان بوایە لای خۆمان بڕیارمان ئەدا. واتە هەر لە ئەزەلدا بڕیارمان ئەداو ئەمانکرد و پەیوەندی بە دروستکراوەکانەوە نەئەبوو" (قەتادە) ئەڵێ وشەی (لهو) لە زمانی (یەمەنی) یەکاندا بەواتای ژنە ﴿إن کنا فاعلین﴾ ئەگەر بڕیاربووبا ئەوکارە ئەنجام بدەین، هەردەمان کرد، بەڵام وامان نەکرد کەوابوو کاری هەوانتەو(لەهو) هەرگیز لای ئێمە نەبووەو نییە"، چونکە ئێمە هەموو شتێکمان بە هەق و راستە، (موقاتل، قەتادە، ئیبنی جورەیج) هەموویان ئەڵێن: (إن کنا فاعلین) بە واتای (ما کنا فاعلین)ـە، وەك (إن انت إلا نذیر). ﴿[١٨] بل نقذف بالحق علی الباطل فیدمغه﴾ نا، ئەوە دەستووری ئێمە نیە: بەڵکو ئێمە دەمانەوێ بەهەق باتڵ بکوتین و داغانی بکەین و لەریشەی بێنین ﴿فإذا هو زاهق﴾ کتوپڕ نابوودبێ و تیابچێت وراستیی جێگەی بگرێتەوە ﴿ولکم الویل مما تصفون﴾ هاوارو واوەیلا وتیاچوون ئەی بێ بڕوایان بۆ ئەو جۆرە درۆو بۆ ختانانەتان بە خوای ئەکەن ﴿[١٩] وله من فی السموات والأرض﴾ هەرچی لەئاسمانەکان و زەوی دایە هەر بۆ خوایە، هەرئەویش دروستی کردوون و، هەر ئەویش ئەتوانێ ئاڵو گۆڕیان تێدا بکات ﴿ومن عنده لا یستکبرون عن عبادته﴾

الجزء السابع عشر — سورة الأنبياء

وَكَمْ قَصَمْنَا مِن قَرْيَةٍ كَانَتْ ظَالِمَةً وَأَنشَأْنَا بَعْدَهَا قَوْمًا
آخَرِينَ ﴿١١﴾ فَلَمَّا أَحَسُّوا بَأْسَنَا إِذَا هُم مِّنْهَا يَرْكُضُونَ ﴿١٢﴾
لَا تَرْكُضُوا وَارْجِعُوا إِلَىٰ مَا أُتْرِفْتُمْ فِيهِ وَمَسَاكِنِكُمْ لَعَلَّكُمْ
تُسْأَلُونَ ﴿١٣﴾ قَالُوا يَا وَيْلَنَا إِنَّا كُنَّا ظَالِمِينَ ﴿١٤﴾ فَمَا زَالَت تِّلْكَ
دَعْوَاهُمْ حَتَّىٰ جَعَلْنَاهُمْ حَصِيدًا خَامِدِينَ ﴿١٥﴾ وَمَا خَلَقْنَا
السَّمَاءَ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَاعِبِينَ ﴿١٦﴾ لَوْ أَرَدْنَا أَن نَّتَّخِذَ لَهْوًا
لَّاتَّخَذْنَاهُ مِن لَّدُنَّا إِن كُنَّا فَاعِلِينَ ﴿١٧﴾ بَلْ نَقْذِفُ بِالْحَقِّ
عَلَى الْبَاطِلِ فَيَدْمَغُهُ فَإِذَا هُوَ زَاهِقٌ وَلَكُمُ الْوَيْلُ مِمَّا تَصِفُونَ
﴿١٨﴾ وَلَهُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَنْ عِندَهُ لَا يَسْتَكْبِرُونَ
عَنْ عِبَادَتِهِ وَلَا يَسْتَحْسِرُونَ ﴿١٩﴾ يُسَبِّحُونَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ
لَا يَفْتُرُونَ ﴿٢٠﴾ أَمِ اتَّخَذُوا آلِهَةً مِّنَ الْأَرْضِ هُمْ يُنشِرُونَ
﴿٢١﴾ لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلَّا اللَّهُ لَفَسَدَتَا فَسُبْحَانَ اللَّهِ رَبِّ الْعَرْشِ
عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٢٢﴾ لَا يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ ﴿٢٣﴾ أَمِ
اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ آلِهَةً قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ هَٰذَا ذِكْرُ مَن مَّعِيَ
وَذِكْرُ مَن قَبْلِي بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ الْحَقَّ فَهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٢٤﴾

٣٢٣

ئەوانەش کە لای ئەون (واتە: فریشتەکان) لەپەرستنی ئەودا خۆ بەزلزان نین ﴿ولا یستحسرون﴾ و هەرگیزیش ماندوو نابن و، هەمووکات و ژیانیان هەر بۆ خواپەرستییە ﴿[٢٠] یسبحون اللیل والنهار لایفترون﴾ بەردەوام بە شەو و بەڕۆژ هەر تەسبیحات وپاکانە ئەکەن و هیچ کات دەست هەڵناگرن و، بەڵکو هەردەم تەسبیحی دەکەن.

**خوا ناڕاستەکانیان:**

﴿[٢١] أم اتخذوا آلهة من الأرض هم ینشرون﴾ ئاخۆ ئەو خوانەناسانە چەند خوایەکیان لە سەرزەویدا بۆخۆیان پەیدا کردووە، ئەوان مردووان زیندوو دەکەنەوە نا، بەڵکو چەند خوایەکی بێ گیانی بێ دەسەڵاتیان هەڵبژاردووە!! ﴿[٢٢] لوکان فیهما آلهة إلا الله لفسدتا﴾ گریمان ئەرلەئاسمان و زەوی چەند خواو پەرستراوێکی هەق -غەیرەزخوا- بەهەق هەبوبا وەك ئەوان پێیان وایە بێ شك ئاسمان و زەویی تێك ئەچوو چونکە سەرەنجام سەری ئەکێشا بۆ ئاژاوەو کێشمانکێش ﴿فسبحان الله رب العرش عما یصفون﴾ جا پاك وخاوێنی، بەرزو بڵندی هەر بۆخوای پەروەردگاری عەرشە، لەو باس وخواسانە ئەوان وەسفی خوای پێدەکەن: هاوبەش و هاوەڵی بۆدائەنێن" ﴿[٢٣] لا یسأل عما یفعل وهم یسألون﴾ چی ئەو زاتە بیکا نابێ لێی بپرسرێتەوە چونکە خوایە، بەڵام لەکارو کردەوەی ئەوانە پرسیار ئەکرێ چونکە بەندەن، کەوابوو ئەبێ هەرگوێڕایەڵی ئەوبن و ئەو بپەرستن ﴿[٢٤] أم اتخذوا من دونه آلهة﴾ ئاخۆ ئەوان بێجگە لەخوا چەند خوایەکیان بۆخۆیان هەڵبژاردووە؟ ﴿قل هاتوا برهانکم﴾ پێیان بڵێ: ئەی موحەممەد! ﷺ بەڵگەی خۆتان بێنن بۆ ڕاستیی ئەوەی ئەیڵێن ﴿هذا ذکر من معی وذکر من قبلی﴾ ئەمەی لەم قورئانەدایە پەندو یادخەرەوەیە بۆخۆم و بۆئەوانەی هاوەڵی منن و لەگەڵمدان، وەبەسەرهاتی پێغەمبەران وگەلانی پێش منیش باس دەکات، دەئایا لە کتێبی هیچ کامێکیاندا هاوەڵ و هاوبەش بۆ خوا ڕەوابووە، ئەی ئێوە ئەوەتان لەکوێ هێنا؟ ﴿بل اکثرهم لایعلمون الحق﴾ بەڵکو ئەوان زۆربەی زۆریان هاوەڵ بۆ خوا دادەنێن و حەق و ڕاستیی نازانن ﴿فهم معرضون﴾ بێ لەوەش ڕوو وەردەگێڕن لە یەك خوا پەرستی و شوێنکەوتنی پێغەمبەر ﷺ ﴿[٢٥] وما ارسلنا من قبلك من رسول﴾ لەپێش تۆشەوە ئەی پێغەمبەر ﷺ هەر پەیامبەرێکمان ناردووە ﴿إلا نوحی إلیه انه لا إله إلا انا فاعبدون﴾ وەحیی و سروشمان بۆکردووە کە: هیچ پەرستراوێك بێ لە من نییە جاکەوایە هەر بەتەنها من بپەرستن.

**خوانەناسان دەڵێن خوا منداڵی هەیە:**

﴿[٢٦] وقالوا اتخذ الرحمن ولدا﴾ بێبڕوایان وتیشیان: خوای بەخشندە فریشتەکانی کردووە بە منداڵ وکچی خۆی!! ﴿سبحانه بل عباد مکرمون﴾ نەخێر، ئەوانە منداڵی خوا نین، بەڵکو کۆمەڵە بەندەیەکی ڕێزداری ئەون و، خوا

الجزء السابع عشر — سورة الأنبياء

وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ
إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ ﴿٢٥﴾ وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَلَدٗاۗ سُبۡحَٰنَهُۥۚ
بَلۡ عِبَادٞ مُّكۡرَمُونَ ﴿٢٦﴾ لَا يَسۡبِقُونَهُۥ بِٱلۡقَوۡلِ وَهُم
بِأَمۡرِهِۦ يَعۡمَلُونَ ﴿٢٧﴾ يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡ
وَلَا يَشۡفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرۡتَضَىٰ وَهُم مِّنۡ خَشۡيَتِهِۦ مُشۡفِقُونَ
﴿٢٨﴾ ۞ وَمَن يَقُلۡ مِنۡهُمۡ إِنِّيٓ إِلَٰهٞ مِّن دُونِهِۦ فَذَٰلِكَ نَجۡزِيهِ
جَهَنَّمَۚ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٩﴾ أَوَلَمۡ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ
أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ كَانَتَا رَتۡقٗا فَفَتَقۡنَٰهُمَاۖ وَجَعَلۡنَا
مِنَ ٱلۡمَآءِ كُلَّ شَيۡءٍ حَيٍّۚ أَفَلَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٣٠﴾ وَجَعَلۡنَا فِي ٱلۡأَرۡضِ
رَوَٰسِيَ أَن تَمِيدَ بِهِمۡ وَجَعَلۡنَا فِيهَا فِجَاجٗا سُبُلٗا لَّعَلَّهُمۡ
يَهۡتَدُونَ ﴿٣١﴾ وَجَعَلۡنَا ٱلسَّمَآءَ سَقۡفٗا مَّحۡفُوظٗاۖ وَهُمۡ عَنۡ
ءَايَٰتِهَا مُعۡرِضُونَ ﴿٣٢﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ وَٱلشَّمۡسَ
وَٱلۡقَمَرَۖ كُلّٞ فِي فَلَكٖ يَسۡبَحُونَ ﴿٣٣﴾ وَمَا جَعَلۡنَا لِبَشَرٖ مِّن قَبۡلِكَ
ٱلۡخُلۡدَۖ أَفَإِيْن مِّتَّ فَهُمُ ٱلۡخَٰلِدُونَ ﴿٣٤﴾ كُلُّ نَفۡسٖ ذَآئِقَةُ
ٱلۡمَوۡتِۗ وَنَبۡلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلۡخَيۡرِ فِتۡنَةٗۖ وَإِلَيۡنَا تُرۡجَعُونَ ﴿٣٥﴾

ربع الحزب ٣٣

٣٢٤ وَإِذَا رَءَاكَ

خۆی هەڵی بژاردوون و، زۆریش پاك وبێخەوشن ﴿[٢٧] لا يسبقونه بالقول﴾ هەرگیز ئەوفریشتانە قسەی خۆیان پێشی قسەی ئەوناخەن، واتە: شتێك ناڵێن لەگەڵ فەرمایشتی خوادا دژبێو نەگونجێت ﴿وهم بأمره يعملون﴾ وەهەر بەپێی فەرمانی ئەو کارئەکەن. ﴿[٢٨] يعلم مابين أيديهم وما خلفهم﴾ خوا بە هەموو ئەحواڵ وئەعمالیان دەزانیٚ، چ ئەحواڵ وئەعمالی پێشیان، چ ئەحواڵ وئەعمالی پاشیان. واتە: خوا دەزانێ بە بەروودوایان ﴿ولا يشفعون إلا لمن ارتضى﴾ لەدوا ڕۆژیشدا تکاو شەفاعەت ناکەن، مەگەر بۆ کەسێك خوا خۆی خۆشنوودو رازی بێ لێی و، خاوەن بڕواو موسڵمان بێ، وەك خۆی ئەفەرموێ: (من ذا الذي يشفع عنده إلا بإذنه)٢/٢٥٥، یان دەفەرموێ: (ولا تنفع الشفاعة عنده إلا لمن أذن له) ٢٣/٣٤. ﴿وهم من خشيته مشفقون﴾ لە زۆر ترسی خواو گەورەیی، هەردەم دەلەرزن وناوێرن سەرپێچی لێبکەن ﴿[٢٩] ومن يقل منهم إني إله من دونه﴾ هەرکەسێك لەوان غەررابێ و بڵێ: منیش خوایەکم جگەلەو،﴿فذلك نجزيه جهنم﴾ ئەوە پاداشتی بە دۆزەخ ئەدەینەوە ﴿كذلك نجزى الظالمين﴾ هەرئاوایش تۆڵە و پاداشتی یاخییان و ستەمکاران ئەدەینەوە.

## ئاسمان و زەمین یەك پارچە بوون:

﴿[٣٠] او لم يرالذين كفروا﴾ ئاخۆ خوانەناسان و بێ باوەڕان نەیانبینیوە، واتە: بە چاوی دڵ سەیریان نەکرد تا بزانن ﴿أن السموات والأرض كانتا رتقا﴾ کە بێگومان ئاسمانەکان و زەویی یەکپارچە بوون و، هەردووپێکەوە نووسابوون , نە ئەم بارانی دەباراند، نە ئەویش ڕووەکی سەوز دەکرد، وەك (ئیبن عەبباس) ئەڵێ ﴿ففتقناهما﴾ جا لە وەو دوائێمە لە یەکمان کردنەوە، بەڵێ ئەمەیە دیدو بۆچوونی ئێمە لەمەڕ سەرەتای دروستبوونی هەردووکیانەوە، ئیتر ئەمڕۆ بیردۆزەکان هەرچی ئەڵێن با بڵێن، ئینجا ئەوەی لەگەڵ قورئاندا شیاوو گونجاو بوو، ئێمەش وەری ئەگرین، ئەگینا ڕەتی ئەکەینەوە.

بیردۆزەکان ئەڵێن: کۆمەڵەی ئەستێرەو کۆمەڵەی خۆر -کە پێکهاتووە لە خۆرومانگ و زەوی- لەسەرەتاوە یەکپارچەو، یەك سەدیم بوون، لەپاشا لە یەك جیا بوونەتەوەو شکڵێکی هێلکەییان بە خۆیانەوە گرتووە، زەویش پارچەیەك بوو لەخۆرو لێی پچڕاو وردە وردە سارد بوویەوە، ئەو بیردۆزانە وا دەڵێن، بەڵام ئێمەش لەوە زیاتر ناتوانین بڕۆین کە قورئان دیاریی دەکات بۆمان جائەگەر بۆچوونی بیردۆزەکانیش لەگەڵ ئەوەی قورئاندا گونجا, ئەوا ئێمەیش وەری دەگرین بەڵام خۆ دەبێ ئەوەش بزانین کە مەبەستی ئەوان لە بۆچوونە کانیاندا ئەوەیە کە ئەم بوونەوەرە گەورەیە هەر لە خۆیەوە ئەو ئاڵو گۆڕە دەکات، نەك خوایەکی بێ وێنە کردبێتی!! ﴿وجعلنا من الماء كل شئ حی﴾ لە ئاویش هەموو شتێکی زیندوومان دروست کرد" واتە: ئاومان گێڕا بە بناغەی هەموو شتێکی زیندوو وهۆکار بۆ ژیان..((عن أبي هريرة أنه قال: يا نبي الله! إذا رأيتك قرت عيني وطابت نفسي، فأخبرني عن -كل شئ- قال: كل شئ خلق من ماء)) أخرجه الحاكم وصححه" ئەبو هورەیرە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا! کاتێ کە ئەتبینم چاوم ڕووناك دەبێتەوەو! دڵم خۆش ئەبێ، حەز ئەکەم ئێستاحەقیقەتی هەموو شتێکم پێ بڵێیت، ئەویش فەمووی: هەموو شتێ لە سەرەتاوە، لە ئاو دروستکراوە. ﴿افلا يؤمنون﴾ ئاخۆ هێشتا هەر بڕوا ناکەن" بە دەسەڵاتی خوا؟"

﴿[٣١] وجعلنا فی الأرض رواسی أن تميد بهم﴾ لەزەویشدا چەند کەژو شاخێکی تابت و مەحکەممان وەدیهێناو دامان چەقاند وکردمانە مێخ، تاجووڵەو لەرزەتان پێ نەکاو، ژیانتان لێ تێك نەچێ ﴿وجعلنا فيها فجاجا سبلا﴾ وە چەندین ڕێگەی پان و ڕێگەی کراوەمان خستە ناویەوە ﴿لعلهم يهتدون﴾ تا ئەوخەڵکە ڕێ دەرکەن و بتوانن بە ئاسانی ئەم شارو ئەو شار بکەن، ئایەتی: (والسماء بنيناها بايد و انا لموسعون) ٥١/٤٧، یاخود ئایەتی (افلم ينظروا الى السماء

فوقهم كيف بنيناها و زيناها و ما لها من فروج) ٦/٤٥. هەر ئەو راستییە دوویات ئەكاتەوە ﴿[٣٢] وجعلنا السماء سقفا محفوظا﴾ ئاسمانیشمان كردە سەقف و میچێكی پارێزراو و پتەوو مەحكەم بۆزەوی ﴿وهم عن آياتها معرضون﴾ كەچی ئەوان هێمان روو وەرگێرن لە هەموو نیشانەكانی لەكاتێكا گشتیئەوانە بەڵگەن بۆ بوونی بەدیهێنەرێك ﴿[٣٣] وهو الذی خلق الليل والنهار والشمس والقمر﴾ هەرئەویشە شەوو رۆژو خۆرو مانگی دروست كردووە ﴿كل فی فلك يسبحون﴾ هەریەكەشیان لە دائیرەو خولگەی خۆی وەك مەلەوان دەخولێتەوە، وەك ئەفەرموێ: (فالق الإصباح و جعل الليل سكنا والشمس والقمر حسبانا ذلك تقدير العزيز العليم) ٩٦/٦ هەر بۆ ئەو مەبەستەیە.

**هیچ كەسێك نەمر نیە:**

﴿[٣٤] وما جعلنا لبشر من قبلك الخلد﴾ ئێمە پێش لەتۆ وامان نەكرد مرۆیەك نەمرێ ﴿أفإن مت فهم الخالدون﴾ ئایا ئەگەر تۆ بمری، ئەوانە ژیانی هەتا هەتاییان دەبێ؟! نە، هەرگیز شتی وانییە، وەك دەفەرموێ: (كل من عليها فان و يبقى وجه ربك ذو الجلال والإكرام) ٥٥/٢٦-٢٧ ﴿[٣٥] كل نفس ذائقة الموت﴾ هەموو گیانێك تامی مردن هەردەچێژێ ودەمرێ ﴿ونبلوكم بالشر والخير فتنة﴾واتە: بەناخۆشیی، خۆشیی، هەژاریی، دەوڵەمەندیی، لەش ساغیی و، نەخۆشیی، تا سابیرو ناشوكر دەركەوێ وەئیللا خوا بۆ خۆی دەزانێ وە بەمەش ئیقامە حوججەیان لە سەر دەكات تا كەس بیانووی نەمێنێ ﴿والينا ترجعون﴾ سەرەنجام هەر بۆلای خۆمان دەگێردرێنەوە ئەوسا بەپێی رەفتارو دەرچوونتان لە تاقی كردنەوەكەدا پاداش و تۆڵە وەرئەگرن.

**خوانەناسان گاڵتەیان بە پێغەمبەر ﷺ دەكرد:**

﴿[٣٦] وإذا رآك الذين كفروا﴾ كاتێ بێ باوەڕەكان تۆ دەبینن ئەی موحەممەد ﷺ ﴿إن يتخذونك إلا هزوا﴾ هەر گاڵتەت پێدەكەن و، ئەڵێن: ﴿أهذا الذی يذكر آلهتكم﴾ ئا

سُورَةُ الأَنبِيَاءِ — الجُزْءُ السَّابِعَ عَشَرَ

وَإِذَا رَءَاكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا أَهَـٰذَا ٱلَّذِي يَذۡكُرُ ءَالِهَتَكُمۡ وَهُم بِذِكۡرِ ٱلرَّحۡمَـٰنِ هُمۡ كَـٰفِرُونَ ﴿٣٦﴾ خُلِقَ ٱلۡإِنسَـٰنُ مِنۡ عَجَلٍۚ سَأُوْرِيكُمۡ ءَايَـٰتِي فَلَا تَسۡتَعۡجِلُونِ ﴿٣٧﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَـٰذَا ٱلۡوَعۡدُ إِن كُنتُمۡ صَـٰدِقِينَ ﴿٣٨﴾ لَوۡ يَعۡلَمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ حِينَ لَا يَكُفُّونَ عَن وُجُوهِهِمُ ٱلنَّارَ وَلَا عَن ظُهُورِهِمۡ وَلَا هُمۡ يُنصَرُونَ ﴿٣٩﴾ بَلۡ تَأۡتِيهِم بَغۡتَةً فَتَبۡهَتُهُمۡ فَلَا يَسۡتَطِيعُونَ رَدَّهَا وَلَا هُمۡ يُنظَرُونَ ﴿٤٠﴾ وَلَقَدِ ٱسۡتُهۡزِئَ بِرُسُلٍ مِّن قَبۡلِكَ فَحَاقَ بِٱلَّذِينَ سَخِرُواْ مِنۡهُم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴿٤١﴾ قُلۡ مَن يَكۡلَؤُكُم بِٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ مِنَ ٱلرَّحۡمَـٰنِۗ بَلۡ هُمۡ عَن ذِكۡرِ رَبِّهِم مُّعۡرِضُونَ ﴿٤٢﴾ أَمۡ لَهُمۡ ءَالِهَةٌ تَمۡنَعُهُم مِّن دُونِنَاۚ لَا يَسۡتَطِيعُونَ نَصۡرَ أَنفُسِهِمۡ وَلَا هُم مِّنَّا يُصۡحَبُونَ ﴿٤٣﴾ بَلۡ مَتَّعۡنَا هَـٰٓؤُلَآءِ وَءَابَآءَهُمۡ حَتَّىٰ طَالَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡعُمُرُۗ أَفَلَا يَرَوۡنَ أَنَّا نَأۡتِي ٱلۡأَرۡضَ نَنقُصُهَا مِنۡ أَطۡرَافِهَآۚ أَفَهُمُ ٱلۡغَـٰلِبُونَ ﴿٤٤﴾

٣٢٥

ئەمەیە ناوی خواكانتان بەخراپە دەبا؟! وە لە جێگەیەكی تردا دەفەرموێ: (وإذا رأوك ان يتخذونك الا هزوا أهذا الذی بعث الله رسولا) ٤١/٢٥ ﴿وهم بذكر الرحمن هم كافرون﴾ كەچی بۆ خۆشیان بەناوو زیكری خوای بە بەزەیی باوەڕدار نین ﴿[٣٧] خلق الانسان من عجل﴾ ئادەمیی لە پەلەو تاڵو كە دروست بووە، واتە: ئەوەندە لەسەرشت بێتاقەت و بێ ئارامە وپەلە دەكات، دەڵێیت هەر لەپەلە دروستكراوە، هەر بۆیەش لەدنیادا پەلەی سزادان ئەكات، وە لە جێگەیەكیتردا ئەفەرموێ: (وكان الإنسان عجولا)١١/١٧. ﴿سأوريكم آياتی فلا تستعجلون﴾ ئێوە پەلەم لێ مەكەن، بەزوویی بەڵگەو نیشانەكانی خۆمتان نیشان ئەدەم، جا ئەو كاتە ئەزانن چۆن تۆڵەتان لێ ئەسێنم و هیچیشتان لەدەستم دەرناچن ﴿[٣٨] و يقولون متى هذا الوعد إن كنتم صادقين﴾ خوانەناسان ئەڵێن: باشە ئەگەر بەراستانە ئەم بەڵێنەتان (بەهاتنیسزا)، كەی دێتە دی هەر بۆیەش ئەوەندە نەفامن وپەلەی بۆئەكەن! ﴿[٣٩] لو يعلم الذين كفروا﴾

ئەگەر ئەو بێ باوەڕانە حاڵی خۆیان زانیبا ﴿حين لا يكفون عن وجوههم النار ولاعن ظهورهم﴾ کاتێ ناتوانن بڵێسەی ئەو ئاگرە لە دەم و چاوو پشتیان دوور بخەنەوە ﴿ولاهم ينصرون﴾ و یارمەتیش نادرێن ئیتر هەرگیز پەلەی سزای ئەو رۆژەیان نەئەکرد ﴿٤٠ بل تأتيهم بغتة﴾ ئەوانە پەلە ئەکەن، خۆ بەپەلەی ئەوانە نابێت، بەڵکو کتوپڕ قیامەتیان دێت ﴿فتبهتهم﴾ جا واقیان وڕدەمێنێ ومات وسەرگەردانیان ئەکا ﴿فلا يستطيعون ردها ولاهم ينظرون﴾ ئیتر ئەوکاتە نە ئەتوانن لەخۆیانی لادەن، وە نە مۆڵەتیش ئەدرێن بۆ تۆبەو پەشیمانی.

**بە پێغەمبەرانی تریش گاڵتە کراوە:**

﴿٤١ ولقد استهزئ برسل من قبلك﴾ لەگاڵتەو لاقرتی ئەوان دڵ زویر مەبە، چونکە گاڵتە بەپێغەمبەرانی بەر لەتۆش ئەی موحەممەد ﷺ کراوە ﴿فحاق بالذين سخروا منهم ماكانوا به يستهزئون﴾ جا دەرەنجام ئەو سزایە ئەوان بەگاڵتەو گەپ گرتبوویان دەوری گرتن ﴿٤٢ قل من يكلؤكم بالليل والنهار من الرحمن﴾ پێیان بڵێ: کێیە کاتێ ئێوە لەجەرگەی شەوو رۆژدان بتوانێ لە سزاو تۆڵەی خوای بەخشندە بتانپارێزێ؟ ﴿بل هم عن ذكر ربهم معرضون﴾ نا، بەڵکو ئەوانە لەیادی پەروەردگاریان روو وەردەگێڕن و بیرناکەنەوە لەدەسەڵاتی خواو بەخەیاڵیانا نایە ﴿٤٣ ام لهم آلهة تمنعهم من دوننا﴾ یاخۆ ئەوان -جگە لەئێمە- چەند خوایەکیان هەیە دەتوانن لە سزای ئێمە بیانپارێزێ؟! ﴿لا يستطيعون نصر انفسهم﴾ نا، ئەوخوا ناهەقانە ناتوانن یارمەتی خۆشیان بدەن و لەسزا خۆیان بپارێزن، ئیتر لەکوێ ئەتوانن پەرستیارەکان بپارێزن ﴿ولاهم منا يصحبون﴾ وە لەلایەن ئێمەشەوە هیچ یارمەتی و پەنایە نادرێن.

**بەتەمەن زۆرییان چەواشە بوون:**

﴿٤٤ بل متعنا هؤلاء وآباءهم حتى طال عليهم العمر﴾ ئێمە بەپەلە تۆڵە لەوانە ناسێنین، بەڵکو ئەوانەو باو باپیرانی ئەوانەشمان بەگوزەرانی خۆشی دونیا بەهرەمەند کرد هەتا تەمەنیان درێژ بوو، وایان دەزانی ئیتر ئەو خۆشی و رابواردنەیە هەر بۆیان ئەمێنێتەوە ﴿افلا يرون انا نأتي الأرض ننقصها من اطرافها﴾ ئایا ئەوانە نابینن کە ئێمە رۆژانە دێین و لە گشت لایەکی وڵات و ناوچەکەیان کەم ئەکەینەوە و، ئەوان بێ دەسەڵات دەکەون، بەم جۆرە ساڵ لەدوای ساڵ فەتحی شوێنەکانیان ئەکەین بۆ پەیامبەر ﷺ، وەك خوا ئەفەرموێ: (ولقد أهلكنا ماحولكم من القرى وصرفنا الآيات لعلهم يرجعون) ٢٧/٤٦ ﴿افهم الغالبون﴾ جا ئایا ئەوانە زاڵن؟ یان ئێمە؟ ﴿٤٥ قل إنما انذركم بالوحى﴾ تۆ پێیان بڵێ: ئەی محمد ﷺ من تەنها هەر بەوەحی هوشیارتان ئەکەمەوەو دەتانترسێنم ﴿ولا يسمع الصم الدعاء إذا ما ينذرون﴾ ئەوان لەبەر درێژە کێشانی پشت کردنیان لە دەنگی هەق خوا مۆری ناوە بەسەر گوێیاندا هەتا وەك کەڕیان لێهاتووە، وە کەڕیش بانگ نابیسێ کاتێ بترسێنرێن بە سزا. ﴿٤٦ ولئن مستهم نفحة من عذاب

الجزء السابع عشر — سورة الأنبياء

قُلْ إِنَّمَا أُنذِرُكُم بِالْوَحْيِ وَلَا يَسْمَعُ الصُّمُّ الدُّعَاءَ إِذَا مَا يُنذَرُونَ ﴿٤٥﴾ وَلَئِن مَّسَّتْهُمْ نَفْحَةٌ مِّنْ عَذَابِ رَبِّكَ لَيَقُولُنَّ يَا وَيْلَنَا إِنَّا كُنَّا ظَالِمِينَ ﴿٤٦﴾ وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئًا وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا وَكَفَىٰ بِنَا حَاسِبِينَ ﴿٤٧﴾ وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَىٰ وَهَارُونَ الْفُرْقَانَ وَضِيَاءً وَذِكْرًا لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٤٨﴾ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِالْغَيْبِ وَهُم مِّنَ السَّاعَةِ مُشْفِقُونَ ﴿٤٩﴾ وَهَٰذَا ذِكْرٌ مُّبَارَكٌ أَنزَلْنَاهُ أَفَأَنتُمْ لَهُ مُنكِرُونَ ﴿٥٠﴾ ۞ وَلَقَدْ آتَيْنَا إِبْرَاهِيمَ رُشْدَهُ مِن قَبْلُ وَكُنَّا بِهِ عَالِمِينَ ﴿٥١﴾ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِ مَا هَٰذِهِ التَّمَاثِيلُ الَّتِي أَنتُمْ لَهَا عَاكِفُونَ ﴿٥٢﴾ قَالُوا وَجَدْنَا آبَاءَنَا لَهَا عَابِدِينَ ﴿٥٣﴾ قَالَ لَقَدْ كُنتُمْ أَنتُمْ وَآبَاؤُكُمْ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ ﴿٥٤﴾ قَالُوا أَجِئْتَنَا بِالْحَقِّ أَمْ أَنتَ مِنَ اللَّاعِبِينَ ﴿٥٥﴾ قَالَ بَل رَّبُّكُمْ رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ الَّذِي فَطَرَهُنَّ وَأَنَا عَلَىٰ ذَٰلِكُم مِّنَ الشَّاهِدِينَ ﴿٥٦﴾ وَتَاللَّهِ لَأَكِيدَنَّ أَصْنَامَكُم بَعْدَ أَن تُوَلُّوا مُدْبِرِينَ ﴿٥٧﴾

فجعلهم جذاذا — ٣٢٦

ربك﴾ ئەوە حاڵیانە، خۆ ئەگەر سۆزەیەك لەهاڵاوی سزای پەروەردگارت لێیان بدات ﴿لیقولن یا ویلنا إنا كنا ظالمین﴾ خێرا خوانەناسان ئەڵێن: ئەی تیاچووی خۆمان!! بێگومان ئێمە هەركەسانێكی ستەمكار بووین بۆیە وامان بەسەرهات ﴿[٤٧] و نضع الموازین القسط لیوم القیامة﴾ بێگومان رۆژی قیامەت ئێمە تەرازووی بەرامبەر دادپەروەریی دائەنێین و كردەوەكانیانی پێ ئەكێشین ﴿فلا تظلم نفس شیئا﴾ ئەوسا هیچ كەسێك كەمترین ستەمی لێناكرێ چ لەچاك كاران و، چ لە خراپكاران ﴿وإن كان مثقال حبة من خردل﴾ تەنانەت ئەگەر كردەوەكانیان بەئەندازەی سەنگی دەنكە خەرتەلەیەكیش بێت كە لەبچووكیدا كراوە بەنموونە ﴿أتینابها وكفى بنا حاسبین﴾ ئێمە ئەیهێنین و ئامادەی ئەكەین، وە ئەوەندە بەسە بۆ ئێمە كە بە وردی ژمێریاری كردەوەكانیان بین، وە لە جێگەیەكیتردا ئەفەرموێ: (ولا یظلم ربك أحدا)٤٩/١٨. یاخود ئەفەرموێ: (إن الله لا یظلم مثقال ذرة)٤٠/٤. یاخود ئەفەرموێ: (یا بنی إنها إن تك مثقال حبة من خردل فتكن فی صخرة أو فی السموات أو فی الأرض یأت بهاالله...) ١٦/٣١.

**كتێبمان بە مووساو هاروون دا:**

﴿[٤٨] ولقد آتینا موسى وهارون الفرقان وضیاء وذكرا للمتقین﴾ بێگومان ئێمە كتێبی جیاكەرەوە (تەورات)مان بەمووساو هاروون دا، كە جیاكەرەوەی حەق وناحەقە، وە روونكەرەوەو بیرخەرەوەو ئامۆژگاریشە بۆ پارێزكاران ﴿[٤٩] الذین یخشون ربهم بالغیب﴾ ئەوانەی كە لەپەنامەكی و پەنهانییدا لەپەروەردگاریان ئەترسن، هەر چەندەیش پەروەردگاری خۆیان نەدیتووە ﴿وهم من الساعة مشفقون﴾ لە بەرپابوونی رۆژی قیامەتیش هەمیشە لە ترسدان ﴿[٥٠] وهذا ذكر مبارك انزلناه﴾ ئەم قورئانەش ئامۆژگارییەكی پیرۆزو بەپیتەو بەزمانی خۆتان ناردوومانە خواریێ ﴿أفأنتم له منكرون﴾ ئاخۆ ئێوە هێمان نكوڵی ئەكەن و دانی پیا نانێن؟.

**سەر گروشتەی ئیبراهیم و قەومەكەی:**

﴿[٥١] ولقد آتینا إبراهیم رشده من قبل﴾ لەمەوبەریش بیر تیژی و رێنوێنیمان بۆ دۆزینەوەی خوای گەورە بە ئیبراهیم بەخشیی، وەك ئەفەرموێ: (وتلك حجتنا آتیناها إبراهیم على قومه) ﴿وكنا به عالمین﴾ ئێمە بە ئەحواڵی ئەو زاناو ئاگادار بووین ﴿[٥٢] إذ قال لأبیه وقومه﴾ ئەوكاتە كە بە باوكیی و نەتەوەكەی خۆی وت: ﴿ما هذه التماثیل التی انتم لها عاكفون﴾ ئەم بت و پەیكەرە بێ گیانانە چین ئێوە هەردەم لەبەریان كەوتوون؟ ﴿[٥٣] قالوا وجدنا آباءنا لها عابدین﴾ لەوەڵامدا وتیان: باوو باپیرانی ئێمەش هەر ئەمانەیان دەپەرست، بۆیە ئێمەش لاسایی و پەیرەوی لەوان ئەكەین ﴿[٥٤] قال لقد كنتم انتم وآباؤكم فی ضلال مبین﴾ ئیبراهیم وتی: ئەگەر راستتان دەوێ باوو باپیرانیشتان هەروەكو خۆتان لە گومرایی و سەرلێشێواوییەكی ئاشكرادا بوون ﴿[٥٥] قالوا اجئتنا بالحق﴾ ئەوانیش وتیان: ئاخۆ تۆ راستیی و هەقێكت بۆ هێناوین ﴿أم انت من اللاعبین﴾ یاخۆ لە گاڵتە چیانی؟ واتە: ئەو قسانەت بەراستە، یان گاڵتەمان پێدەكەی؟ ﴿[٥٦] قال بل ربكم رب السموات والأرض﴾ ئیبراهیم وتی: من گاڵتەچی نیم و بەراستیمە، چونكە ئەوانە هیچیان خوا نین.. بەڵكو پەروەردگاری ئێوە، پەروەردگاری ئاسمانەكان و زەوییە ﴿الذی فطرهن﴾ ئەوەی دروستیی كردوون هەر ئەویش شایستەی پەرستنە ﴿وأنا على ذلكم من الشاهدین﴾ منیش خۆم لەسەر ئەو راستیە كە یەك خوا هەیەو ناوی (الله)یەو، گشت خواكانی ئێوەش پرووپووچن لەرێزی شایەدانم.

**ئیبراهیم بتەكانی تیكەتیكە كرد:**

﴿[٥٧] وتالله لأكیدن أصنامكم بعد أن تولوا مدبرین﴾ سوێند بەخوا پاش ئەوە كە پشت هەڵكەن نەخشەیەك دەكێشم بۆ تێكشكاندنی بتەكانتان، ئیبراهیم ئەمەی لە بەرخۆیەوە گوت كاتێك كە ئەیانویست برۆنە دەرەوە بۆ

جەژن وسەفاوسەیران چونکە لەساڵێکا جارێك خڕ ئەبوونەوەو ئەچوون بۆ جەژنگێڕان، جا بۆ ئامادە بوونی ئەو
رۆژە ئیبراهیمیشیان دەعوەت کرد، ئەویش بە بیانووی نەخۆشی نەرۆشت, وە هەر لە دوای ئەوان ویستی نەڕواو
لەڕێگە زوو بگەڕێتەوەو کارو نەخشەی خۆی ئەنجام بدا، بۆیە وتی: (إنی سقیم) ﴿٥٨ فجعلهم جذاذا إلا کبیرا لهم﴾
بەر بووە بتەکان وهەموویانی وردو خاش کردن، بتە گەورەکەیان نەبێ, ئەوی هێشتەوەو تەورەکەی لە سەر دانا،
وەك ئەفەرموێ: (فراغ علیهم ضربا بالیمین). ﴿لعلهم إلیه یرجعون﴾ بەڵکو بێنەوە پرسیاری ئەو کارەساتە لەو بکەن
و یەخەی ئەو بگرن و، بۆشیان دەرکەوێ کە ناتوانێ هیچ قسەیش بکاو وەڵام بداتەوە! ئیتر چۆن ئەبێ بکرێت
بەخوا؟! ﴿٥٩ قالوا من فعل هذا بآلهتنا﴾ بەڵێ، گەڕانەوەو کارەساتەکەیان چاو پێکەوت وتیان: ئاخۆ کێ ئاوای بە
خواکانمان کردووە؟ ﴿إنه لمن الظالمین﴾ دیارە کەسێکە
لەستەمکارانەو" ئەبێ تۆڵەی خۆی وەربگرێ ﴿٦٠ قالوا
سمعنا فتی یذکرهم یقال له إبراهیم﴾ کاتی خۆی گوێیان لە
ئیبراهیمەوە ببوو بێزاری لە بتەکانیان دەردەبڕی (وتالله
لأکیدن أصنامکم) بۆیە وتیان: ئێمە بیستوومانە لەلاوێك
جاربەجار خواکانی ئێمەی بەخراپە باس ئەکرد، وە ئەویش
پێیان دەگوت ئیبراهیم. جا ئەمکارە، ببێ و نەبێ هەر کاری
ئەوە ﴿٦١ قالوا فأتوا به علی أعین الناس﴾ وتیان: دە بیهێنن
بەبەر چاوی خەڵکیەوە لێی بکۆڵنەوە ﴿لعلهم یشهدون﴾
شایەد ئەوانیش بەئاگابن بەوەی ئەنجامی داوە.﴿٦٢ قالوا:
أأنت فعلت هذا بآلهتنا یا إبراهیم﴾ ئەوسا کۆبوونەوەو
ئیبراهیمیان هێناو وتیان: ئاخۆ تۆ ئەم کارەت بەخواکانمان
کردووە ئەی ئیبراهیم؟ دیارە ئەوانە هێشتا ژیر نەبوون، بۆیە
هێمان هەر بەخوا ناویان ئەبەن!! ﴿٦٣ قال بل فعله کبیرهم
هذا﴾ ئیبراهیم وتی: بەڵکو بتە گەورەکەیان ئەمەی کردووە!
ئیبراهیم دەیەوێ بە خۆیاندا بچنەوە وبۆیان ڕوون بێتەوە
ئەوانە خوا نین وبە کەڵکی خوایەتی نایێن. (ئەبوداود،
تیرمزیی، ئیبنولمونزیر، ئیبن ئەبی حاتم) لە (ئەبا هورەیرەوە) هێناویانەو ئەڵێن: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((لم یکذب
إبراهیم في شئ قط إلا في ثلاث کلهن في الله: قوله: (إني سقیم) ولم یکن سقیما، وقوله لسارة: أختي، وقوله "(بل فعله
کبیرهم هذا). ئەم ریوایەتە بەدرێژتر لەبوخاریی وموسلیمیشدا هاتووە. واتە: هەرگیز ئیبراهیم درۆی نەکردووە،
مەگەر لەسێ حاڵەتدا، ئەویش لەبەر خوا بوو، وتی: من نەخۆشم، نەخۆشیش نەبوو، وتی: سارە خوشکمە،
خوشکیشی نەبوو، وتی: ئەم بتە گەورەیە ئەوکارەی کردووەو بتە گەورەکەیش نەی کردبوو. وتی: ﴿فاسألوهم إن
کانوا ینطقون﴾ دە ئەوەتانێ لێیان بپرسن ئەگەر قسە ئەکەن.

الجزء السابع عشر — سورة الأنبياء

فَجَعَلَهُمْ جُذَٰذًا إِلَّا كَبِيرًا لَّهُمْ لَعَلَّهُمْ إِلَيْهِ يَرْجِعُونَ
٥٨ قَالُوا۟ مَن فَعَلَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَآ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ٥٩
قَالُوا۟ سَمِعْنَا فَتًى يَذْكُرُهُمْ يُقَالُ لَهُۥٓ إِبْرَٰهِيمُ ٦٠ قَالُوا۟ فَأْتُوا۟ بِهِۦ
عَلَىٰٓ أَعْيُنِ ٱلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَشْهَدُونَ ٦١ قَالُوٓا۟ ءَأَنتَ فَعَلْتَ
هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَا يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ ٦٢ قَالَ بَلْ فَعَلَهُۥ كَبِيرُهُمْ
هَٰذَا فَسْـَٔلُوهُمْ إِن كَانُوا۟ يَنطِقُونَ ٦٣ فَرَجَعُوٓا۟ إِلَىٰٓ
أَنفُسِهِمْ فَقَالُوٓا۟ إِنَّكُمْ أَنتُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ٦٤ ثُمَّ نُكِسُوا۟ عَلَىٰ
رُءُوسِهِمْ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا هَٰٓؤُلَآءِ يَنطِقُونَ ٦٥ قَالَ
أَفَتَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكُمْ شَيْـًٔا وَلَا
يَضُرُّكُمْ ٦٦ أُفٍّ لَّكُمْ وَلِمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَفَلَا
تَعْقِلُونَ ٦٧ قَالُوا۟ حَرِّقُوهُ وَٱنصُرُوٓا۟ ءَالِهَتَكُمْ إِن كُنتُمْ
فَٰعِلِينَ ٦٨ قُلْنَا يَٰنَارُ كُونِى بَرْدًا وَسَلَٰمًا عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ ٦٩
وَأَرَادُوا۟ بِهِۦ كَيْدًا فَجَعَلْنَٰهُمُ ٱلْأَخْسَرِينَ ٧٠ وَنَجَّيْنَٰهُ
وَلُوطًا إِلَى ٱلْأَرْضِ ٱلَّتِى بَٰرَكْنَا فِيهَا لِلْعَٰلَمِينَ ٧١ وَوَهَبْنَا
لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ نَافِلَةً وَكُلًّا جَعَلْنَا صَٰلِحِينَ ٧٢

٣٢٧

**قەومەکەی ئیبراهیم بەخۆدا چوونەوە:**

﴿[٦٤] فرجعوا إلى انفسهم﴾ جا ئیتر کەمێك داچڵەکان و چوونەوە به خۆیاندا وئیعاده نەزەریان کرد.﴿فقالوا إنکم انتم الظالمون﴾ دەرەنجام وتیان بەخۆیان: ئێوە هەر خۆتانن ستەمکار، نەك ئیبراهیم، ئەگینا شتێ قسە نەکاو، دەسەڵاتی نەبێ بەرگری لە خۆی بکا، ئەوشتە چۆن ئەبێ به خوا؟! ﴿[٦٥] ثم نکسوا على رؤوسهم﴾ "هەردوای ئەوە، کە گەڕانەوە لای بیرو ژیریی خۆیان" زۆری نەخایاند دیسانەوە سەرەوخوار بوونەوە "لەراکەی خۆیان لایانداو کەوتنەوە دەمەقاڵێ و وتیان:"﴿لقد علمت ما هؤلاء ینطقون﴾ ئەی ئیبراهیم! بێگومان بۆ خۆت ئەزانیت کە ئەوانە گۆیا وقسەکەرنین، ئیترچۆن ئەڵێی لەوان بپرسن؟﴿[٦٦] قال: افتعبدون من دون الله ما لا ینفعکم شیئا ولا یضرکم﴾ ئیبراهیم ئەوپێ لێنانەی ئەوانی بەهەل زانی، بۆیە وتی: باشە، ئاخۆ غەیرەزخوا شتێ ئەپەرستن کە نەهیچێ کەڵکتان پێدەگەیەنێ ونەهیچێ زیانیشتان لێدەدا؟! ﴿[٦٧] اف لکم ولما تعبدون من دون الله﴾ بێزاریو ئۆف لە ئێوەو لەوشتانەش کە لەجێی خوا ئەیپەرستن ﴿افلا تعقلون﴾ ئایا ئاوەز ناخەنە کار؟.

**ئیبراهیمیان خستە مەنجەنیقەوە:**

﴿[٦٨] قالوا حرقوه﴾ دیارە خواکانیان هیچ دیفاع وبەرگرییان بۆخۆیانیش لێ نەهات، بۆیە ئەمان بەرگرییان لێ کردن و وتیان: ئیبراهیم بسوتێنن. ئیمامی (بوخاریی) لە ئیبنی عەباسەوە دەڵێ: کاتێ ئیبراهیم تووڕ درایە نێو ئاگرەکەوە وتی: (حسبنا الله ونعم الوکیل)، هەم پێغەمبەریش موحەمەد ﷺ کاتێ پێیان وت: خەڵکێکی زۆرتان بۆخڕ بووەتەوە، حەقە لێیان بترسن وچارەیەکی خۆتان بکەن، کەچی لەباتی ترس و حیساب بۆ کردنیان ئیمانیان زیاتر بووبە بەڵێن و بڕیارەکانی خوای خۆیان و فەرموویان: (حسبی الله ونعم الوکیل). ﴿وانصروا آلهتکم﴾ یارمەتی خواکانتان بدەن!! ئەی هاوار وئۆف بۆئەو خوایانە کە نەتوانن بەرگری لەخۆشیان بکەن ﴿إن کنتم فاعلین﴾ ئەگەر ئێوە شتێکتان لەدەست دێ، جا ئەوانیش ئاگرێکی زۆرگەورەیان کردەوە, پاش ئەوە کە نزیکەی مانگێك دارو چیلکەیان بۆ کۆکردەوە" پاشان ئیبراهیمی حەقدۆستی تێ فڕێ درا!! ﴿[٦٩] قلنا یا نار کونی بردا وسلاما على إبراهیم﴾ خوای گەورە دەفەرموێ: ئێمەش وتمان: ئەی ئاگر! ساردو بێ زیان بە لەبۆ ئیبراهیم، جا ئیتر دەست بەجێ ئاگرەکە سارد بوویەوەو بوو بەخۆشیی و، سەلام بۆی، بەڵام چۆن سارد بوویەوە؟ ئەم پرسیارە بۆدەبێ بکرێ، چونکە هەر ئەوکەسە کە ئەفەرمووێ: (کن فیکون) هەر ئەویش ئەفەرمووێ: (یا نار کونی..). ﴿[٧٠] وارادوا به کیدا﴾ ویستیان بەو کارە فێڵێ لە ئیبراهیم بکەن و لەناوی ببەن ﴿فجعلناهم الأخسرین﴾ بەڵام ئێمە ئەوانمان زۆر زەرەرمەندتر کرد. ئیمامی (ئەحمەد، ئیبن ماجە، ئیبن حیبان.. تەبەریی) لەخاتوو عائیشەوە دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((إن إبراهیم حین ألقي في النار لم تکن دابة إلا تطفی منه النار غیر الوزغ فإنه کان ینفخ على إبراهیم)) کاتێ کە ئیبراهیم هەڵدرایە ناو ئاگرەکەوە، هیچ دەعبایەك نەما هەوڵی کوژاننەوەی نەدا (وەزەغ) نەبێ، بۆیە کوشتنی ڕەوایەو ڕێیپێدراوە. قسەیەك بۆ مێژوو: تەفسیری(فتح القدیر)ی شەوکانی دەڵێ: (وقیل: هذا القائد هو نمرود، وقیل: رجل من الأکراد). (قورتوبیی)ش دەڵێ: (روى أن قائل هذه المقالة هو رجل من الأکراد من أعراب فارس (أى من بادیتها) قاله ابن عمر و مجاهد وابن جریج، ویقال إسمه (هەیزەن). ئیبن کەسیر – لە تەبەرییەوە– دەڵێ: (بإشارة رجل من أعراب فارس من الأکراد..). (روح المعانی) دەڵێ: (أخرج إبن جریر عن مجاهد قال: تلوت هذه الآیة على عبد الله بن عمر فقال: أتدری یا مجاهد! من الذى أشار بحریق إبراهیم بالنار؟ قلت: لا. قال: رجل من أعراب فارس یعنی الأکراد، ونص –على أنه من الأکراد ابن عطیة، وذکر أن الله تعالى خسف به الأرض فهو یتجلجل

فیها إلى یوم القیامة) پاشان لێکۆڵەرەوەکەی: (محمد حسین العرب) ئەڵێ: (هذا ظاهر فی أن الأکراد من الفرس، وقد ذهب کثیر إلى أنهم من العرب، وذکر أن منهم أبا میمون بن جابان من الصحابة ﵁.

**مەبەست لە هێنانی ئەم راوبۆچوونانە چەن خاڵێکە، لەوانە:**

١- خوای گەورە خۆی چاکتر دەزانێت" ئەوکەسە کێ بووە" لە چ نەژادو گەل و نەتەوەو هۆزێك بووە؟

٢- گێرانەوەی ئەو شتانە - بۆمێـژوو- نابنە بەڵگەو سەرچاوە بۆ ڕاستیەکان، چونکە مێژوو سەرچاوەیەکی ڕەوان و دیاریی و باوەڕ پێکراوی نیە، بۆیە ئێمەی موسڵمان: گش ڕووداوەکانی رابوردوو، هەموو شتێکی ئێستاو ئایندەشمان لەگەڵ (قورئـان) و (فـەرمووده) ڕاستـەکان هەڵدەسـەنگێنن، وە بەئاشـکراش هـەردوویان -قورئـان و فەرمووده- دەست نیشانی کەسێکی تایبەتیان نەکردووە.

٣- نابێ بەوتی" وتی، قەومێك، هۆزێك، نەتەوەیەك کەم ئیعتبار بکرێ و نرخی کەم بکرێتەوە لەمێژووی پرشنگداری ئیماندارانداا، لەحاڵێکا کە ئەو قەومە سەدان و هەزاران مێری مەردی، جوامێری پێشکەش بەئیسلام کردبێت.

٤-ئەوقسەو قسەلۆکانە - زۆرجاران- کراونەتە بەڵگەی لاڕێی و خراپی گەلی کورد، تەنانەت (تەفسیری روح البیان)ی (ئیسماعیل حەق)ی لەو دەرگایەوە، زۆر شتان دەڵێ بەگەلی کورد!!

الجزء السابع عشر — سورة الأنبياء

وَجَعَلْنَاهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا وَأَوْحَيْنَا إِلَيْهِمْ فِعْلَ
الْخَيْرَاتِ وَإِقَامَ الصَّلَاةِ وَإِيتَاءَ الزَّكَاةِ وَكَانُوا لَنَا
عَابِدِينَ ﴿٧٣﴾ وَلُوطًا آتَيْنَاهُ حُكْمًا وَعِلْمًا وَنَجَّيْنَاهُ مِنَ
الْقَرْيَةِ الَّتِي كَانَت تَّعْمَلُ الْخَبَائِثَ إِنَّهُمْ كَانُوا قَوْمَ سَوْءٍ
فَاسِقِينَ ﴿٧٤﴾ وَأَدْخَلْنَاهُ فِي رَحْمَتِنَا إِنَّهُ مِنَ الصَّالِحِينَ
﴿٧٥﴾ وَنُوحًا إِذْ نَادَىٰ مِن قَبْلُ فَاسْتَجَبْنَا لَهُ فَنَجَّيْنَاهُ
وَأَهْلَهُ مِنَ الْكَرْبِ الْعَظِيمِ ﴿٧٦﴾ وَنَصَرْنَاهُ مِنَ الْقَوْمِ
الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا إِنَّهُمْ كَانُوا قَوْمَ سَوْءٍ فَأَغْرَقْنَاهُمْ
أَجْمَعِينَ ﴿٧٧﴾ وَدَاوُودَ وَسُلَيْمَانَ إِذْ يَحْكُمَانِ فِي الْحَرْثِ إِذْ
نَفَشَتْ فِيهِ غَنَمُ الْقَوْمِ وَكُنَّا لِحُكْمِهِمْ شَاهِدِينَ ﴿٧٨﴾
فَفَهَّمْنَاهَا سُلَيْمَانَ وَكُلًّا آتَيْنَا حُكْمًا وَعِلْمًا وَسَخَّرْنَا
مَعَ دَاوُودَ الْجِبَالَ يُسَبِّحْنَ وَالطَّيْرَ وَكُنَّا فَاعِلِينَ ﴿٧٩﴾
وَعَلَّمْنَاهُ صَنْعَةَ لَبُوسٍ لَّكُمْ لِتُحْصِنَكُم مِّن بَأْسِكُمْ
فَهَلْ أَنتُمْ شَاكِرُونَ ﴿٨٠﴾ وَلِسُلَيْمَانَ الرِّيحَ عَاصِفَةً تَجْرِي بِأَمْرِهِ
إِلَى الْأَرْضِ الَّتِي بَارَكْنَا فِيهَا وَكُنَّا بِكُلِّ شَيْءٍ عَالِمِينَ ﴿٨١﴾

٣٢٨ — وَمِنَ الشَّيَاطِينِ

**ئیبراهیم بە هاوڕێیەتی لووط لە عێراق باری کرد بۆ شام:**

﴿ ٧١ ونجینـاه ولوطـا إلى الأرض التـى بارکنـا فیهـا للعـالمین﴾ ئێمـە (ئیـبراهیم) و (لـووت) ی برازایشـمان لەدەسـتیان ڕزگـار کـرد و لـەولاتی (عێـراق)ـەوە ڕۆشـتن بۆدەڤەری (شام) و بەرەو ئەو وڵاتـەی کەبۆ هەموو خەڵکان، پـیرۆزو پـڕ بەرەکـەتمان کـرد، وە پێغەمبـەرانی زۆریشـمان بۆنـارد.﴿ ٧٢ ووهبنـا لـه إسـحاق ویعقـوب نافلـة﴾ ئیسحاقیشمان بە ئیبراهیم -دوای ئەوەی داوای لێ کردین- بەخشی، پاشان (یەعقووب)یشمان بەزیادەبەش پێبەخشیی، واتە: زیادلەداواکەی خۆی ﴿وکلا جعلنا صالحین﴾ و هەریەك لەوانەشمان کردە ئەهلی خێرو چاکە ﴿٧٣ وجعلناهم ائمة یهدون بأمرنا﴾ وکردیشمانن بە سەرۆك و پێشەوا، کـە هـەر بەفـەرمانی ئێمـە مـەردم ڕێنـوێن و شارەزا بکـەن بـۆلای ئـایینی خـوا ﴿وأوحینـا إلـیهم فعل الخیرات﴾ بەهەڕووشیانمان نیگاکرد کە بەردەوام گشت کارە چاکەکان ئەنجام بدەن ﴿وإقام الصلاة وإیتاء الزکاة﴾ و هەڵسن بە نوێژ، زەکات لەماڵ و سامانیان بدەن ﴿وکانوا لنا عابدین﴾ وهەمیشەش هەموو ئەو بەڕێزانە ئێمەیان دەپەرست و گوێرایەڵی بڕیاروفەرمانی ئێمە بوون ﴿ ٧٤ ولوطا آتیناه حکما وعلما﴾ وردبینیی‌و فەرمانی پێغەمبەرێتی و زانستمان بە (لووت)یش بەخشی، واتە: کردمانە پەیامبەرو ناردمان بۆ گوندەکانی‌دەڤەری (سەدوم) ﴿ونجیناه من القریة التى کانت تعمل الخبائث﴾ ولەو شارەی (سدوم)ـە کە خەڵکێکی زۆر خراپ و یاخیبوون و لەفەرمانی خوا دەرچووبوون و

کاری درزێویان تێدا دەکرد، رزگار کرد ﴿إنهم كانوا قوم سوء فاسقين﴾ چونکە بە راستیی خەڵکی ئەوێ زۆر خراپ و لە رێ لادەر بوون ﴿٧٥ وادخلناه فی رحمتنا إنه من الصالحين﴾ و بردمانە ناو بەزەیی و میهرەبانیی خۆمانەوە، چونکە پیاوێکی صاڵح و چاك رەفتار بوو.

### نووح و قەومەکەی:

﴿٧٦ ونوحا إذ نادى من قبل﴾ و باسی داستانی (نووح)یش بکە، کە بەر لەو پێغەمبەرانەوە رقی لە گەلەکەی هەستاو داوای لەخوا کرد کە لەناویان ببا ﴿فاستجبنا له﴾ ئێمەیش نزاکەیمان گیراکردو وەڵاممان دایەوە ﴿فنجيناه واهله من الكرب العظيم﴾ و خۆیی و خەڵکەموسڵمانەکەیمان لەبەڵا گەورەو سەختەکە رزگار کرد، واتە: ئەوەی بڕوای هێناو هاتە ناو کەشتییەکەوە رزگاری بوو، ئەوەیش بڕوای نەهێنا نقوم بوو ﴿٧٧ ونصرناه من القوم الذين كذبوا بآياتنا﴾ وە لەبەرامبەر ئەو قەوم و هۆزەیەوە کە نیشانەکانی ئێمەیان بەدرۆ خستەوە یارمەتیماندداو سەرمانخست ﴿إنهم كانوا قوم سوء﴾ چونکە بەڕاستیی ئەوان گەلێکی ئێجگار نالەبارو خراپەکار بوون ﴿فأغرقناهم أجمعين﴾ هەموویانمان لەئاو نقوم کردو کەسیان لێ دەر نەچوو.

### داستانی داوود و سولەیمان (علیهما السلام):

﴿٧٨ وداود وسليمان إذ يحكمان فى الحرث﴾ لە داودو سولەیمانیش باسێك بکە ئەوکاتە کە سەبارەت بە کێڵگەیەك داوەرییان کرد ﴿إذ نفشت فيه غنم القوم﴾ ئەوسا کە مەڕومالاتی هۆزێك بێ شوان بە شەو تێی کەوتبوون و تێیدا لەوەڕابوون ﴿وكنا لحكمهم شاهدين﴾ و ئێمە شایەدو ئاگاداری داوەرییەکەی هەردووك بووین ﴿٧٩ ففهمناها سليمان﴾ چارەسەری کێشەکەمان فێری سولەیمان کردو تێمان گەیاند کە چۆن بڕیار بدا ﴿وكلا آتيناه حكماوعلما﴾ بەهەردووك – داودو سولەیمان – داوەریی و زانیاریمان پێ بەخشین، راڤەکەرانی قورئان ئەڵێن: دوو پیاو سکاڵاو کێشەیەکیان هەبوو: کە رانەمەڕێك چوو بووە ناو کێڵگە و کشتوکاڵی کابرایەك و زیانێکی گەورەی لێ دابوو، بردیانە لای (داود)و ئەویش بڕیاریدا: لەباتی زیانەکە رانەمەڕەکە بدرێ بەخاوەن دەغڵ ودانەکە، دیارە ئەوەش بەدڵی خاوەن مەڕەکە نەبوو، بۆیە هەردووکیان چوونە لای سولەیمان و بەسەرهاتەکەیان بۆ گێڕایەوە، پاشان ئەویش چوو بۆلای داودی باوکی و سەلامی لێ کردوو وتی: بەڕای من ئەگەر زەوییەکە بەخاوەنی مەڕەکان بدرایەو، بیکردایە بەدەغڵ ودان، تاوەك خۆی لێ ئەهاتەوەو، مەڕەکانیش بدرایە لای خاوەن زەوییەکە کەڵکی لەشیرو خوری و بەرەکەی وەرگرتایە، جا هەر کاتێ کشتوکاڵەکە وەك خۆی لێ هاتەوە بدرێتەوە بە خاوەنەکەی. (داود) وتی: رۆڵەکەم: بڕیارەکەت باش وپەسەندە، شیاوی باسە داوەر هەرکات دەقێکی دەست نەکەوت بۆ پشتگیریی بڕیارەکەی، دەتوانێ پەنا بباتە بەر (ئیجتیهاد) هەر بۆیە ئەو دوو پێغەمبەرە بەڕێزەیش بڕیارەکانیان لێك جیاواز بوو، پێغەمبەریش موحەممەد ﷺ هەر لەو بارەیەوە دەفەرموێ: ((إذا اجتهد الحاكم فأصاب فله أجران، وإذا اجتهد فأخطأ فله أجر واحد)) بوخاریی. واتە: هەرگا داوەر ئیجتیهاد بکاو، پڕ بەپڕمەبەستەکەی پێکا، ئەوەلای خوا دوو جار پاداشی بۆهەیە، خۆ ئەگەر نەی پێکاو بەهەڵەدا چوو، ئەوە یەك پاداشی بۆهەیە. ﴿وسخرنا مع داود الجبال يسبحن والطير﴾ کێوەکان و پەلەوەرەکانیشمان ملکەچ و رام کرد، کە هەموان لەتەك داوودا پێکەوە تەسبیحاتی خوا بکەن. داود بە ئاوازو دەنگە خۆشەکەی خۆی تەسبیحاتی ئەخوێندو، گشت بوونەوەریش لەگەڵیا ئەیوتەوە، جا ئیتر چۆن وبەچ شێوەیەك؟ ئێمە هەموو ملکەچی ئەو شتانەین کە لەقورئاندا هاتوون ﴿وكنا فاعلين﴾ زۆر بەتواناو بەکاریش بووین بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە ﴿٨٠ وعلمناه صنعة لبوس لكم﴾ فێریشمان کرد کەچەندین جۆر پۆشاکی

جەنگیی دروست بکابۆتان، خوا جۆرەها قەڵغان و زرێی نیشاندا کە دروستی بکات بۆ خۆپاراستن لەکاتی جەنگدا. بەڵێ پیشەسازیی و تەکنەلۆجیا هەر لە پەیامبەرانەوە ورده ورده هەنگاوی هاویشتووە، ئەگەرچی بەیناو بەینیش پشوویەکی دابێت، بەڵام نەك وەك ئێستا موسڵمانان بەتەواوی دەستیان لێ شۆربێ!﴿لتحصنكم من بأسكم﴾ تا لە زەبری یەکتر لە کاتی جەنگەکاندا بتانپارێزێ ﴿فهل انتم شاكرون﴾ دە ئاخۆئێوە لەبەرامبەر ئەو نیعمەتانەوە سوپاسگوزار ئەبن؟ واتە: دەسوپاسی خوا بکەن. داستانی داوود ﷺ بەو شێوەیە بەکورتی باسکرا، ئینجا چیرۆکی سولەیمانیش بەم شێوەیە دەست پێ ئەکا: ﴿[٨١] ولسليمان الريح عاصفة﴾ بۆ سولەیمانیش بایەکی سەختی بەهێزمان رەخساندو رام کرد ﴿تجري بأمره إلى الأرض التي باركنا فيها﴾ بەفەرمانی ئەو دەڕۆشت بۆ ناوچەو وڵاتی شام، کە پڕپیت و پیرۆزمان کرد بە خێرات و بەرووبوم و نێردرانی زۆربەی پێغەمبەران لەوێ ﴿وكنا بكل شئ عالمين﴾ وە ئێمە بە هەموو شتێ زاناو ئاگادار بووین، خۆمان چاك ئەمانزانی سولەیمان ئەو پلەیەی شایستەیە لەم باسەی سولەیمانەدا وتوێژێکی زۆر هەیە، زۆربەشیان دەست هەڵبەستی جوولەکەیەو، بۆیە ئێمەش بێجگە لە دەقە قورئانیەکە ناڕۆینە ناو کێشەکەوە ﴿[٨٢] ومن الشياطين من يغوصون له﴾ وە هەروا لە شەیاتینەکانیش کەسانێکمان رام کردبوو بۆی ئەڕۆیشتنە ناو بنی دەریاکانەوە مرواری و مەرجانیان بۆ دەردەهێنا ﴿ويعملون عملا دون ذلك﴾ و بێجگە لەوەیش کاری تریشیان بۆ ئەنجام ئەدا، کە مرۆیەکان بۆیان ئەنجام نەئەدرا ﴿وكنا لهم حافظين﴾ خۆیشمان چاودێرو پارێزەریان بووین، نەمان دەهێشت لەفەرمانی ئەو لا بدەن. لەم باسی جنییانەدا گەلێ چیرۆك و داستانی جوولەکەی تێکەڵ کراوە، بۆیە ئێمەش لەم ئەندازەدا ئەوەستین.

الجزء السابع عشر | سورة الأنبياء

وَمِنَ ٱلشَّيَٰطِينِ مَن يَغُوصُونَ لَهُۥ وَيَعۡمَلُونَ عَمَلٗا
دُونَ ذَٰلِكَۖ وَكُنَّا لَهُمۡ حَٰفِظِينَ ﴿٨٢﴾ ۞ وَأَيُّوبَ إِذۡ
نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلضُّرُّ وَأَنتَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٨٣﴾
فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ فَكَشَفۡنَا مَا بِهِۦ مِن ضُرّٖۖ وَءَاتَيۡنَٰهُ أَهۡلَهُۥ
وَمِثۡلَهُم مَّعَهُمۡ رَحۡمَةٗ مِّنۡ عِندِنَا وَذِكۡرَىٰ لِلۡعَٰبِدِينَ ﴿٨٤﴾
وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِدۡرِيسَ وَذَا ٱلۡكِفۡلِۖ كُلّٞ مِّنَ ٱلصَّٰبِرِينَ
﴿٨٥﴾ وَأَدۡخَلۡنَٰهُمۡ فِي رَحۡمَتِنَآۖ إِنَّهُم مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ
﴿٨٦﴾ وَذَا ٱلنُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَٰضِبٗا فَظَنَّ أَن لَّن نَّقۡدِرَ عَلَيۡهِ
فَنَادَىٰ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي
كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٧﴾ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ وَنَجَّيۡنَٰهُ
مِنَ ٱلۡغَمِّۚ وَكَذَٰلِكَ نُـۨجِي ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٨٨﴾ وَزَكَرِيَّآ
إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥ رَبِّ لَا تَذَرۡنِي فَرۡدٗا وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡوَٰرِثِينَ
﴿٨٩﴾ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ وَوَهَبۡنَا لَهُۥ يَحۡيَىٰ وَأَصۡلَحۡنَا
لَهُۥ زَوۡجَهُۥٓۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِ
وَيَدۡعُونَنَا رَغَبٗا وَرَهَبٗاۖ وَكَانُواْ لَنَا خَٰشِعِينَ ﴿٩٠﴾

٣٢٩

### یادێکی ئەیوب پێغەمبەر ﷺ:

﴿[٨٣] وأيوب إذ نادى ربه﴾ باسێکی بەسەرهات و چیرۆکی (ئەیوب)یش بکە کاتێ کە پاڕایەوەو هاواری لە پەروەردگاری خۆی کردو وتی: ﴿أني مسني الضر﴾ بێگومان دووچاری بەڵاو نەخۆشییەك بووم ﴿وأنت أرحم الراحمين﴾ ئەتۆیش لەهەموو خاوەن بەزەییەکان بەبەزەیی تری. ئەیوب ﷺ پەیامبەرێك بوو خوای دلۆڤان منداڵ وسامانێکی زۆری پێدابوو، بەڵام دواتر بە ئیرادەو بڕیاری خۆی هەمووی تیاچوو، ئەویش هیچ گوێی نەداو پێی تێك نەچوو، پاشان نەخۆشیش درا بەسەریاو، زۆریش بەئارام و بەوێڵەوە داوای شیفای لەخوا کرد ﴿[٨٤] فاستجبنا له﴾ ئێمەیش بەهانایەوە چووین و وەڵاممان دایەوە ﴿فكشفنا ما به من ضر﴾ غەمو پەژارەو نەخۆشیمان لە سەر لابرد ﴿وآتيناه أهله ومثلهم معهم﴾ وە هەموو خێزانەکەیمان پێدایەوەو ئەوەندەی تریش لەگەڵیا ﴿رحمة من عندنا﴾ بە بەزەییەك لە لای خۆمانەوە بە ئەیوبدا ﴿وذكرى للعابدين﴾ کردمان بە بیرەوەریی و پەندیش بۆ بەندە خواپەرستەکان

تا ئەوانیش وەك ئەو لە كاتی مەینەتی و بەڵاو نەهاتدا ئارامیان ببێ و چاو لەو بكەن ﴿٨٥ و إسماعیل و إدریس و ذا الكفل﴾ باسی (ئیسماعیلی كوڕی ئیبراهیم و، ئیدریسی كوڕی شیت و، زولكیفل)یش بكە ﴿كل من الصابرین﴾ هەریەكێكیان لەدەستەی خۆڕاگران و ئارامگران بوون بەرامبەر بە بەڵاو تاقیكردنەوەكان چونكە، ئیسماعیل بوو ئامادەیی خۆی دەربڕی بۆ سەربڕینەكە. دەڵێن ئیدریس: ناوی –ئوزوریس– بووەو، میسریەكان پەرستوویانەو، یەكەم كەسێكیش بووە ئەوانی فێری كشتوكاڵ و پیشەسازی كردووە!. زولكیفلیش: كات و شوێنی و جێگەی ژیانی نادیارە لای ئێمە، بەڵام ئەوە ئاشكرایە كە پەیامبەرێكی بەنی ئیسرائیلییە ﴿٨٦ وأدخلناهم فی رحمتنا﴾ هەموویانمان بەهۆی ئارامیی و صەلاحەتیانەوە خستە ناو سۆزو میهرەبانی خۆمانەوە بەهەشت و پەیامبەرێتیمان پێ بەخشین ﴿إنهم من الصالحین﴾ چونكە ئەوان لە پیاوچاكان و ساڵحان بوون. روونكردنەوەیەك: ئەو درۆیانەی لەبارەی (ئەیوب)ەوە ﷺ هەڵبەستراون و خزێنراونەتە تەفسیرەكانەوە، هیچ زانایەكی تێگەیشتوو فامیدە ددانی پیادا نانێ، بەڵكو زانایان هەموو یەك دەنگن لەوەدا كە ئەو داستانە دەستی جوولەكەی تێخراوە، چونكە پێغەمبەران خوایان لە سەر بێ دەبێ لەهەر عەیبێك بەریی و پاك بن و، گشت هەستیارەكانیشیان سەلامەت بن.

**خاوەن ماسی یەكە (یونس ﷺ):**

﴿٨٧ وذا النون إذ ذهب مغاضبا﴾ باسێكی خاوەن ماسییەكەیش (یونس) بكە، بەڵێ هەرلەبەر ئەوە (یونس) كاتی خۆی ماسی قوتییدا ئێستا پێی ئەڵێن (زەنوون) "خاوەن ماسیی ئەوەش ئەوكاتە بوو بە ڕق و قینێكی زۆرەوە قەوم و گەلەكەی بەجێ هێشت و ڕۆیشت، پاش ئەوەی زۆری لەگەڵ وتن بڕوا بێنن، بڕوایان نەهێناو بێ سوود بوو، ئیتر وای بەچاك زانی بەجێیان بهێڵێ و، روو بكاتە وڵاتێكیتر بۆ گەیاندنی بانگەوازەكەی خوا ﴿فظن ان لن نقدر علیه﴾ ئەو پێی وابوو ئێمە دەربەست نین و دونیای لێ تەنگ ناكەینەوە "چونكە بەبۆچوونی ئەو زەویی فراوانە و، ئەڕوا بۆ شارو گوندێكی ترو خەڵكیش زۆرە بانگیان بكات بۆلای خوا ﴿فنادی فی الظلمات﴾ جا ڕقەكەی بەرەو دەریا بردیی و، سواری كەشتیی بوو ودەرەنجام بەهۆی باری قورسی كەشتییەكەوە فڕێ درایە ناو دەریاكەوەو ماسی قوتی دا، ئەویش لەناو تاریكستانی شەوو دەریاو ناوسكی نەهەنگەكەدا هاوارو بانگی لەخوا كردو وتی: ﴿ان لا إله إلا انت﴾ پەروەردگارا!بێ لە تۆ هیچ پەرستراوێك شك نابەم ﴿سبحانك إنی كنت من الظالمین﴾ هەر تۆیش لە هەموو نەنگێك خاوێن رائەگرم، بێگومان من لەڕیزی ستەمكاران بووم" ستەمم لە خۆم كردو، پەشیمانم ﴿٨٨ فاستجبنا له ونجیناه من الغم﴾ سا ئێمەش بەهانایەوە هاتین و وەڵاممان دایەوەو لەو تەنگانەو خەم و پەژارەیە تێیكەوتبوو ڕزگارمان كرد ﴿وكذلك ننجی المؤمنین﴾ هەروەك یونسمان ڕزگار كرد هەر ئاوایش هەموو بڕواداران ڕزگار ئەكەین, دیارە ئەوەش بە ڕەچاوكردنی مەرجەكانی دوعا. شیاوی باسە خوا قەوم وهۆزەكەی یونسی رزگار كرد كاتێ ئیمانیان هێنا وەكو لەم ئایەتەدا: (فلولا كانت قریة آمنت فنفعها إیمانها إلا قوم یونس لما آمنوا كشفنا عنهم عذاب الخزی فی الحیاة الدنیا ومتعناهم إلی حین)(١٠/٩٨. هەر واتای ڕزگار كردنی هۆزەكەی (یونس)ە. پاشان پەشیمان بوونەوەیان.

**زەكەریاو یەحیا سڵاویان لێ بێ:**

﴿٨٩ وزكریا إذ نادی ربه﴾ هەروەها زەكەریاش وەبیر بێنە كە لەناخی دڵیەوە هاوارو بانگی لە پەروەردگاری خۆی كردو وتی: ﴿رب لا تذرنی فردا﴾ ئەی پەروەردگارا! هەر بە تەنهاییم مەهێڵەوە بێ منداڵ و واریس، ئەڵێن ئەو دەمە تەمەنی زەكەریا گەیشتبووە سەد ساڵ و، تەمەنی ژنەكەشی نەوەدو نۆ ساڵ بوو، هێمان هیچ منداڵیان نەبوبوو

﴿وانت خير الوارثين﴾ وە تۆش چاكترینی واریسانی بۆ من، واتە: هەر ئەتۆم بەسە ئەگەر واریسیشم پێنەبەخشی. ﴿[٩٠] فاستجبنا له﴾ دوعامان لێ گیرا كردو وەڵاممان دایەوە ﴿ووهبنا له يحيى﴾ و یەحیایاشمان پێ بەخشیی ﴿وأصلحنا له زوجه﴾ و ژنەكەییشمان بۆ هێنایە باری مندالْ بوون لەحاڵێكا پێشتر منداڵی نە ئەبوو ﴿إنهم كانوا يسارعون في الخيرات﴾ چونكە ئەوان هەموویان لە كاری خێرو چاكەدا بەردەوام پەلەو تالوكەیان دەكرد﴿ويدعوننا رغبا ورهبا﴾ هەمیشە لەبەر هیوای میهرەبانی و رەحمەتی ئێمەدا نزایان دەكرد، وە لەترسی دۆزەخ هاواریان دەكرد ﴿وكانوا لنا خاشعين﴾ لە ئاست ئێمە هەمووكات خۆ بەكەم زان و ملكەچی كارو فەرمانی ئێمە بوون.

**باسی مەریەم و عیسا (درووديان لێ بێ):**

﴿[٩١] والتى أحصنت فرجها﴾ هەروەها وەبیر بێنە (خاتوو مەریەم) ئەو ژنەی كە شەرم و داوێنی خۆی پاك و خاوێن راگرت و پاراستیی لە حەرام، بۆیە، ناوی مەریەمی نەهێنا، بەڵكو فەرمووی: (والتی..) چونكە لێرەدا مەبەست باسی پێغەمبەرانەو، تەنها كورەكەشی (عیسا) لە زنجیرەی پەیامبەرانە، نەك خۆی. ﴿فنفخنا فيها من روحنا﴾ ئینجا ئێمەش بەهۆی فریشتەی خۆمانەوە "جوبرەئیل" فوومان پێدا كرد و بووبەهۆی سك پربوونی و" عیسای لێ بوو!! (شێخی سابوونیی) لەپەراوێزی (ئیبن كەسیر)دا دەڵێ: (يراد من الفرج: فرج القميص، أي لم يعلق بثوبها ريبة، أي أنها طاهرة الأثواب" قال السهيلي: فلا يذهبن وهمك إلى غير هذا من لطيف الكناية..). واتە: مەبەست بەبێژەی (فەرج)یەخەی كراسەكەی خاتوو (مەریەم)ـە" واتە: ئەو قەت جێی بەدگومانی نەبووەو، هەمیشە دامێن پاكبووە، بۆیە وەك تەفسیری (سوهەیلی) دەڵێت: نابێ بیر لەهیچ شتێكی دیكە بكرێتەوە، بەتایبەتی كە (روح القدس= جوبريل) بەفەرمانی

سُورَةُ الأنبيَاء — الجزءُ السَّابع عَشَر

وَالَّتِيٓ أَحۡصَنَتۡ فَرۡجَهَا فَنَفَخۡنَا فِيهَا مِن رُّوحِنَا
وَجَعَلۡنَٰهَا وَٱبۡنَهَآ ءَايَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿٩١﴾ إِنَّ هَٰذِهِۦٓ
أُمَّتُكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَأَنَا۠ رَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُونِ ﴿٩٢﴾
وَتَقَطَّعُوٓاْ أَمۡرَهُم بَيۡنَهُمۡۖ كُلٌّ إِلَيۡنَا رَٰجِعُونَ ﴿٩٣﴾
فَمَن يَعۡمَلۡ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَلَا كُفۡرَانَ
لِسَعۡيِهِۦ وَإِنَّا لَهُۥ كَٰتِبُونَ ﴿٩٤﴾ وَحَرَٰمٌ عَلَىٰ قَرۡيَةٍ
أَهۡلَكۡنَٰهَآ أَنَّهُمۡ لَا يَرۡجِعُونَ ﴿٩٥﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا فُتِحَتۡ
يَأۡجُوجُ وَمَأۡجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٖ يَنسِلُونَ ﴿٩٦﴾
وَٱقۡتَرَبَ ٱلۡوَعۡدُ ٱلۡحَقُّ فَإِذَا هِيَ شَٰخِصَةٌ أَبۡصَٰرُ ٱلَّذِينَ
كَفَرُواْ يَٰوَيۡلَنَا قَدۡ كُنَّا فِي غَفۡلَةٖ مِّنۡ هَٰذَا بَلۡ كُنَّا
ظَٰلِمِينَ ﴿٩٧﴾ إِنَّكُمۡ وَمَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ
ٱللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمۡ لَهَا وَٰرِدُونَ ﴿٩٨﴾ لَوۡ كَانَ
هَٰٓؤُلَآءِ ءَالِهَةٗ مَّا وَرَدُوهَاۖ وَكُلّٞ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٩٩﴾
لَهُمۡ فِيهَا زَفِيرٞ وَهُمۡ فِيهَا لَا يَسۡمَعُونَ ﴿١٠٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ
سَبَقَتۡ لَهُم مِّنَّا ٱلۡحُسۡنَىٰٓ أُوْلَٰٓئِكَ عَنۡهَا مُبۡعَدُونَ ﴿١٠١﴾

٣٣٠ لَا يَسۡمَعُونَ

خوای (قُدّوس) ئەوكارەی ئەنجام داوە، چۆن دەبێ بیر لەشتێ تر بكرێتەوە. ﴿وجعلناها وابنها آية للعالمين﴾ مەریەم و كورەكەیشمان كردە موعجیزەو نیشانەیەكی گەورەو بێ وێنە بۆ هەموو خەڵكانی جیهان، چونكە تائەو سەردەمە شتی وا نەبوبوو ولە ئاییندەشا هەرگیز نایشبێت. ﴿[٩٢] إن هذه أمتكم أمة واحدة﴾ بەراستیی ئەم پەیامبەرو ئوممەتانەن هاوبیروهاو رێبازی ئێوەن كە یەك گەل و یەك ئوممەتن" عەقیدەیان یەكەو، یەك شێوە ئەرۆن و هەر هەمووشیان بۆ خوا كار ئەكەن، بەڵام موشریكەكان كەناریان لێگرتوو لێیان جیا بوونەوە! ﴿وانا ربكم فاعبدون﴾ منیش پەروەردگاری ئێوەم، دەشێ تەنها منیش بپەرستن ﴿[٩٣] وتقطعوا أمرهم بينهم﴾ لەگەڵ ئەوەشدا كە هەموو پەیامبەران و ئوممەتانیان ئیش و كاروئەركیان یەك بووە وعەقیدەشیان یەك بووە، بەڵام زۆربەی ئەوانە لەئاینی یەكتاپەرستیی لایانداو كاروباری ئاینەكەیان لە ناوخۆیاندا بچر بچر كردو بوونە چەند

گروپ و چەند دەستەوە ﴿كل إلینا راجعون﴾ هەریەكێ لەوانیش- لەدوارۆژدا- بۆلای ئێمە ئەگەڕێنەوە بۆحیساب و لێپرسینەوە ﴿٩٤ فمن یعمل من الصالحات وهو مؤمن﴾ جا هەركەسێك لە كارو كردەوەی چاك خەریك بێ، لەهەمان كاتدا بڕواداریش بێت ﴿فلا كفران لسعیة﴾ بێگومان تەقالاو هەوڵ و تێكۆشانەكانی بەزایە ناچن و ون نابن ﴿وإنا له كاتبون﴾ بێگومان ئێمە كۆششەكەی بۆدەنوسین وهیچ شتێكی لێ گوم نابێت ﴿٩٥ وحرام علی قریة اهلكناها انهم لا یرجعون﴾ خەڵكانی هەرشارو گوندێكیان لەناومان بردبن هەرگیز جارێكی تر ناتوانن بەرەو دوا بگەڕێنەوە بۆدونیاو، تەوبەیان لێوەرناگیردرێ.

## یاجوج و ماجوج:

﴿٩٦ حتی إذا فتحت یاجوج ومأجوج﴾ دونیاش بەردەوام دەبێت تا ئەو كاتەی دەرگا- بەربەستەكەی ذوالقرنین- لە تیرەی (یاجوج و ماجوج) ئەكرێتەوەو بڵاوئەبنەوە، كە ئەوەش نیشانەی نزیكبوونەوەی كۆتایی دونیایە, جا ئەوانیش ﴿وهم من كل حدب ینسلون﴾ لەهەموو بەرزایی وكون و كەلێنێكەوە بە پرتاو دادەپڕن و دەر دەچن، واتە: یاجوج و ماجوج لە هەموو دەرگاو ڕێگایەكەوە دێنە دەرەوە بۆ فەسادو گێرە شێوێنی. بەڵام ئاخۆ یاجوج و ماجوج كێن؟ و ئێستا لەكوێن؟ چیان لێ هات؟ یاخود سەرئەنجام چیان لێ دێت؟ ئەمانە كۆمەڵێ پرسیارن و وەڵامەكەیان زۆر گرانە، وە ئێمە بێجگە لەوەی لەقورئاندا هاتووە هیچ شتێ نازانین، ئەگەرچی لەوانەیشە هەر شەپۆلەكەی "تەتار" بووبێ، چونكە لە نزیك شاری تیرمیزدا سەددێك دۆزراوەتەوە ناوبانگی بە "باب الحدید" دەركردووە، وە زانای ئەڵمانی (سیل بردر) لە سەرەتای سەدەی پازدەدا سەرێكی لەوێ داو لە نووسینەكەیدا تۆماری كرد، لەوە ئەچێ ئەو جێگایە،هەر جێگا كەی یاجوج و ماجوج بێت ﴿٩٧ واقترب الوعد الحق﴾ ئەوسا ئیتر بەڵێنە ڕاست و دروستەكەش "بۆ هاتنی قیامەت" نزیك دەبێتەوە، واتە: هەر یاجوج و ماجوج لەو جێگای خۆیانە هاتنە دەرێ، ئەوە ئیتر قیامەتیش نزیكە ﴿فإذا هی شاخصة ابصار الذین كفروا﴾ ئەوسا ئیتر چاوی ئەو كەسانەی خوانەناس و بێ بڕوان ئەبڵەق ئەبێ و، لەجێی خۆی ناجووڵێ، واتە: لەبەر نارەحەتی ئەو ڕۆژە چاویان بۆ ناتروكێ ﴿یا ویلنا قد كنا فی غفلة من هذا﴾ هاواریان لێ بەرز ئەبێتەوە وئەڵێن: ئەی تیاچووە خۆمان! بەڕاستیی ئێمە لە غەفلەت و بێئاگاییدا بووین لەم ڕۆژە﴿بل كنا ظالمین﴾ نەك هەر غافڵ بووین، بەڵكو ستەمكاریش بووین لە خۆمان.

## خۆتان و بتەكانتان سووتەمەنی دۆزەخن:

﴿٩٨ إنكم وما تعبدون من دون الله حصب جهنم﴾ ئینجا ئەم بڕیارە دەر ئەچێ و پێیان ئەوترێ:بێگومان ئێوەو ئەوشتانەش لەجێی خوا ئەتانپەرستن" گشت دەبنە دارو دەوەن و سووتەمەنی دۆزەخ ﴿انتم لها واردون﴾ هەر دەبێ "لەگەڵ بتەكاندا" بچنە نێویەوە ﴿٩٩ لوكان هؤلاء آلهة ما وردوها﴾ بەموشریكان دەوترێت: خۆ ئەگەر ئەو بتانە وەك ئێوە پێتان وایە- خوا بوونایە ئاوا نەئەچوونە ناو دۆزەخەوە ﴿وكل فیها خالدون﴾ هەر هەمووشیان -پەرستیارو پەرستراو- لەدۆزەخدان بەهەتاهەتایی ئەمێننەوە ﴿١٠٠ لهم فیها زفیر﴾ لەوێ هەناسەدانێكی زۆر توندیان بۆهەیە.﴿وهم فیها لا یسمعون﴾ وە لەبەر ئێش وئازارو نارەحەتی لەدۆزەخدا هیچ قسەیەكی خۆش نابیستن، كڵپە كڵپی جەهەننەم نەبێ ﴿١٠١ إن الذین سبقت لهم منا الحسنی﴾ بێگومان كەسانێك لە پێشدا لە لایەن ئێمەوە بەهۆی كاروكردەوە چاكەكانیانەوە، بەڵێنی پاشە ڕۆژی چاكتریان پێدرابوو. ﴿اولئك عنها مبعدون﴾ ئەوانە لەو ئاگرە دوور

ڕادەگێردرێن و گەرماو نارەحەتیش ناچێژن ﴿[١٠٢] لا یسمعون حسیسها﴾ دەنگی قرچەو بڵێسەی دۆزەخ نابیستن ﴿وهم فی ما اشتهت أنفسهم خالدون﴾ بەڵکو ئەوانە لەناو نازو نیعمەتێکدان کە نەفسیان حەزی پێ دەکات، وە بە هەتا هەتاییش لەوێ ئەمێننەوە ﴿[١٠٣] لا یحزنهم الفزع الأکبر﴾ تەنگانەی بێ سنوور" ترسە گەورەکەی ئەو ڕۆژە ئەوان زویر و غەمگین ناکات ترسی لێپرسینەوەو حیساب و کیتابیان نی یە ﴿وتتلقاهم الملائکة﴾ وە بەڵکو فریشتەکانیش بەڕووی خۆشەوە لەدەرگای بەهەشتدا پێشوازییان لێ ئەکەن ﴿هذا یومکم الذی کنتم توعدون﴾ و پێیان ئەڵێن: ئەوا ئەمڕۆ هەر ئەو ڕۆژەیە کە "لەدونیادا" بەڵێنتان پێ درابوو.

## ئاسمان وەك قاقەزی تۆمار هەڵدەپێچرێ:

﴿[١٠٤] یوم نطوی السماء کطی السجل للکتب﴾ باسی ئەو ڕۆژەبکە ئاسمان، وەکو هەڵپێچانی تۆماری قاقەز بۆ نووسین هەڵدەپێچین، چۆن نووسەر ئەو پەڕەی بەردەستی لوول ئەکاو ئەیپێچێتەوە، ئەمەش هەر ئەوەیە کە خوای گەورە دەربارەی ئەفەرموێ: (وما قدروا الله حق قدره والأرض جمیعا قبضته یوم القیامة والسموات مطویات بیمینه..)٦٧/٣٩. ئیمامی بوخاریش ئەم فەرموودەیە دەهێنێ: ((إن الله یقبض یوم القیامة الأرضین، وتکون السموات بیمینه)).واتە: بەڕاستی لە ڕۆژی قیامەتدا خوا گشت زەوییەکان دەگرێ و، ئاسمانەکانیش هەموو بەدەستیەوەن، ئەم باسە زیاتر لە سوورەتی (زومەر)دا روونکراوەتەوە. ﴿کما بدانا أول خلق نعیده﴾ هەر وەك چۆن لە سەرەتاوە دروستمان کرد، دیسان هەر ئاوایش وەك خۆی لێ ئەکەینەوە ﴿وعدا علینا﴾ بەڵێنێکە ئەنجامدانی لەسەر ئێمەیە ﴿إنا کنا فاعلین﴾ و بێگومانیش ئێمە هەر ئەنجامی ئەدەین. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((إنکم تحشرون إلی الله –عز وجل– حفاة عراة غرلا، کما بدأنا أول خلق نعیده وعدا علینا إنا کنا فاعلین)) پێشەوا ئەحمەد. بێگومان ئێوە گشتتان بەپێی پەتیی و، سەرو لاشەی رووت و قووت و، خەتەنە نەکراوەیی وەك ڕۆژی لەدایك بوونتان گشت کۆدەکرێنەوە و دەبرێن بۆلای خوا، هەر وەکو چۆن یەکەم جار دروستمان کردوون، هەر ئاواش ئەتان گێڕینەوە، ئەمە بەڵێنێکە ئەنجام دانەکەی لەسەر ئێمەیە، خۆ ئێمەش هەمیشە بەکارو لێهاتوو بووین.

الجزء السابع عشر — سورة الأنبياء

لَا يَسْمَعُونَ حَسِيسَهَا وَهُمْ فِي مَا اشْتَهَتْ أَنفُسُهُمْ خَالِدُونَ ﴿١٠٢﴾ لَا يَحْزُنُهُمُ الْفَزَعُ الْأَكْبَرُ وَتَتَلَقَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ هَٰذَا يَوْمُكُمُ الَّذِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴿١٠٣﴾ يَوْمَ نَطْوِي السَّمَاءَ كَطَيِّ السِّجِلِّ لِلْكُتُبِ كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُ وَعْدًا عَلَيْنَا إِنَّا كُنَّا فَاعِلِينَ ﴿١٠٤﴾ وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِن بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ ﴿١٠٥﴾ إِنَّ فِي هَٰذَا لَبَلَاغًا لِّقَوْمٍ عَابِدِينَ ﴿١٠٦﴾ وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ ﴿١٠٧﴾ قُلْ إِنَّمَا يُوحَىٰ إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ فَهَلْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٨﴾ فَإِن تَوَلَّوْا فَقُلْ آذَنتُكُمْ عَلَىٰ سَوَاءٍ وَإِنْ أَدْرِي أَقَرِيبٌ أَم بَعِيدٌ مَّا تُوعَدُونَ ﴿١٠٩﴾ إِنَّهُ يَعْلَمُ الْجَهْرَ مِنَ الْقَوْلِ وَيَعْلَمُ مَا تَكْتُمُونَ ﴿١١٠﴾ وَإِنْ أَدْرِي لَعَلَّهُ فِتْنَةٌ لَّكُمْ وَمَتَاعٌ إِلَىٰ حِينٍ ﴿١١١﴾ قَالَ رَبِّ احْكُم بِالْحَقِّ وَرَبُّنَا الرَّحْمَٰنُ الْمُسْتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ﴿١١٢﴾

سُورَةُ الحَجِّ — آياتها ٧٨

٣٣١

## ئەم زەمینە هەر بۆ بەندە صالحەکان دەبێ:

﴿[١٠٥] ولقد کتبنا فی الزبور من بعد الذکر﴾ بێگومان ئێمە لەکتێبی (زەبوور)ی (داود)دا لەپاش تۆمار کردنی لە (لوح المحفوظ)دا نووسیمان و بڕیارماندا ﴿أن الأرض یرثها عبادی الصالحون﴾ کە بەندە ساڵحەکانم دەسەڵات و حکومەتی ئەم زەوییە بەدەست ئەگرن. بەڵێ خوای گەورە ئادەمیزادی خستە سەر زەویی بۆ ئاوەدان کردنەوەیی و،

بەدەست هێنانی خێرو بەروو بوومی، بەرنامەو پرۆگرامیشی پێدان، جا کەواتە هەر لەبناغەدا خوای گەورە ئەم زەوییەی بۆ بڕواداران دروست کردووە، بۆیە پێویستە لەسەریان بەبڕوای دروست و هەوڵ و تێکۆشان و مەزراو کشتوکاڵ، ئاوەدانی بکەنەوە ﴿١٠٦ إن فی هذا لبلاغا لقوم عابدین﴾ بێگومان ئا لەم قورئانەدا باسمانکرد ڕاگەیاندنێکی ئاشکراو ڕوون هەیە بۆ کەسانی خوا پەرست , یاسای بوونەوەرو پاشەڕۆژو ژیان وگەیشتن بە خۆشنوودی خوا,بۆ هەرگەلێکی پەرستیار وخوا ناسە, ئەوانەی سەر لەخۆیان تێك نادەن و، تەنهاو تەنها ئەم قورئانە دەکەنە بەرنامەی ژینیان.

## پێغەمبەر ڕەحمەت و چاکە بوو بۆ گشت خەڵکانی جیهان:

﴿١٠٧ وما ارسلناك إلا رحمة للعالمین﴾ ئێمە هەر بۆیە تۆمان نارد کەرەحمەت و بەزەیی و میهرەبانییەك بیت بۆ هەموو جیهانیان تادەستیی تەواوی مەردوم بەرەو هیدایەت و ڕێگەی بەختیاریی بگریی، دیارە هەر تەنها ئەوانەش بەهرەمەند ئەبن پێت کە خۆشیان ئامادە بن بۆ بیستنی بانگەوازەکەت، ئیمامی (موسلیم) ئەم فەرموودەیەی هێناوە: ((إني لم أُبْعَثْ لَعَّانا، وإنما بُعِثْتُ رحمةً)) واتە: بێگومانە کە من بۆ ئەوە نەنێراوم هەردەم نەفرینکارو نزاکاری شەڕو خراپە بم بۆ خەڵکان، بەشکوم هەر بەرەحمەت و میهرەبانیی و، دڵاوایی ڕەوانە کراوم. یان دەفەرموێ: ((إنما أنا رَحْمَةٌ مُهْداة)) من هەر ڕەحمەت و شارەزا کراوێکی دەستی خوام و نێردراوم بۆلای ئێوە، واتە: خراپەکاریی و، ئەزیەت و ئازاردان، ئەمانە هیچیان کاری من نین/ ئیبن عەساکیر.

## کاکڵی وەحیی یەکخوا پەرستیە :

﴿١٠٨ قل إنما یوحی إلي انما إلهكم إله واحد﴾ پێیان بڵێ: بەڕاستیی من هەر بۆیە وەحیی و نیگام بۆ کراوە کە بڵێم پەروەردگارو پەرستراوی ئێوە، هەر خوایەکی تاك و تەنیایە ﴿فهل انتم مسلمون﴾ ئاخۆ ئێوە تەسلیم و ملکەچ دەبن؟واتە: ملکەچبن بۆ پەرستنی خوا بە تاك و تەنیاو, فەرمان و بڕیارەکانی بی دووو سێ ئەنجام بدەن ﴿فإن تولوا فقل آذنتكم علی سواء﴾ خۆ ئەگەر ملکەچ نەبوون و پشتیان هەڵکرد، پێیان بڵێ: وا من بە یەکسانی پەیامی خوام بەهەمووتان ڕاگەیاند، پاش ئەوەو پاش تەسلیم نەبوونتان, ئیتر لە نێوان ئێمەو ئێوەدا تەنها جەنگ ماوە. ﴿وإن أدری أقریب أم بعید ما توعدون﴾ من نایشزانم هاتنی ئەو سزایەی بەڵێنتان پێ دراوە نزیکە و زوو دێتە جێ" یان دوورە و ماوەیەك دەخایەنێ. لەدونیادا ئەبێ، یان لە دواڕۆژدا؟ ﴿١١٠ إنه یعلم الجهر من القول ویعلم ما تكتمون﴾ بێگومان ئەو زاتەبە گوفتاری ئاشکراتان ئەزانێ و، بەوەش هەر دەزانێ ئێوە ئەیشارنەوە ﴿١١١ وإن أدری لعله فتنة لكم﴾ وەمن نایشزانم لەوانەیە دواخستنی ئەو سزایە هەر بۆ تاقیکردنەوەیەك بێت بۆتان ﴿ومتاع إلی حین﴾ ڕابواردنێك بێ تا ماوەیەکی دیاریکراو ,ئەوجا سزاکەتان بۆ بێت ﴿١١٢ قال رب احكم بالحق﴾ جا دوای گەیاندنی پەیامەکەیی و گوێ نەدانی خوانەناسان پێی، پەیامبەر ڕوو ئەکاتە پەروەردگاریی خۆیی و ئەڵێ: ئەی پەروەردگارم! لەنێوان من و ئەوانەدا بڕیاری ڕاستەقینەی خۆت بدە، چونکە من زۆر هەوڵمداو هۆشیارم کردنەوە، لە سزای تۆ ئاگادارم کردنەوە، بەڵام باوەڕیان نەهێنا، جا ئیتر تۆیش چۆن باشە" بڕیاری خۆت بدە ﴿وربنا الرحمن المستعان علی ما تصفون﴾ پەروەردگارمان -کە خوایەکی بەخشەرە- کۆمەك لێخوازراوە بۆ تۆڵەو جەزرەبەدان لەسەر ئەوقسە ناقۆڵاو ناشیاوانەتان, هەر ئەویشە یارمەتیم ئەداو سەرم ئەخا بە سەر ئێوەدا، ئەر ئێوە لارو لاسار بن، چونکە من هەوڵێکی زۆرم لەگەڵدان, بەڵام ئێوە هەرنەتان بیست!.

فرە چاو لەبەروو مەمنوونم کە خوای دەهندەو پەروەرێنم، پشتیوانی کردم بۆ نووسینی تەفسیری سوورەتی (ئەنبیاء).

*** *** ***

## ٢٢- سوورەتی ( حەج )ـە

## مەدەنییەو ( ٧٨ ) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتە وەك سوورەتە مەدەنییەکانی تر، گرنگییەکی زۆر دەدا بە نەخشەو یاسادانان، هەرچەند کەش و هەوای سوورەتە مەککەییەکانیشی بەسەرا زاڵە، چونکە ئەمیش هەرباسی ئیمان و باوەڕ و یەکتاپەرستیی و، ئاگادارکردنەوەو ترساندن و زیندوو بوونەوەو پاداش و تۆڵەو نیشاندانی دیمەنەکانی ڕۆژی قیامەت دەکات، خۆ ئەمانەش هەرهەموو باسی سەرەکی سوورەتە مەککەییەکانن، لەلایەکیشەوە مۆڵەتدان بە (قیتال) و جەنگ و کوشتارو، یاسادانان بۆ حەج و، دیاریی و قوربانیی بۆ (کابە)ی شەریفەو، فەرماندان بە جیهاد لەڕێی خوادا.. ئەمانە هەر هەموو باسی سوورەتە مەدەنییەکانن، بۆیە هەندێ لە زانایان دەڵێن: ئەم سوورەتەیە هاوبەشە لەنێوان مەککەیی و مەدینەیی دا.

* لەسەرەتاوە بەباسێکی سامناك و ترسێنەر: (یا أیها الناس اتقوا ربکم إن زلزلة الساعة شئ عظیم) دەست پێدەکات، کە بەڕاستی هەمووکەسێك دادەچڵەکێنێ و سەرسام دەمێنێت، تەنانەت دایکی بەسۆزی شیردەریش چاوەکانی مۆڵەق و زەق دەبێ و، خۆشەویستی کۆرپەلەکەی خۆی لەبیر دەچێتەوە، هەروەك ژنی دووگیانیش منداڵی لەبار دەچێ و، مرۆڤەکان هەموو عەقڵ و ژیرییان تێك دەچێ و، وەك مەست و سەرخۆشیان لێدێ و، تەنانەت خزم و کەس و کاری نزیکیش لەتاو قورسیو ناڕەحەتی ئەو ڕۆژە لە یەکتر هەڵدێن و ڕادەکەن:

* کۆمەڵێ بەڵگەی بەهێز دێنێتەوە بۆ ڕاستیی ئەو ڕووداوە گەورەیە: ڕۆژی قیامەت، بەگشت بوونەوەریش دەڵێت: باشە! دەسەڵاتێك بتوانێ ئەم هەموو قۆناغانە بەسەر مرۆڤدا بێنێو تێپەڕێنێ: (یا أیها الناس إن کنتم فی ریب من البعث..) پاشانیش پاداش، یان تۆڵە وەردەگرێتەوە، ئەی چۆن ناتوانێ مردووان زیندوو بکاتەوە؟!

* چەند دیمەنێکی دڵتەزێنی ڕۆژی قیامەت باس دەکات، دەرەنجام چاکان لە بەهەشتداو، خراپان لە دۆزەخدا هەموو خۆیان دەبیننەوە.

* وێنەی چەند شارو وڵاتێکی کاول و وێرانکراو، بەهۆی سەرپێچی و یاخی بوونیانەوە دێنێتەوە، لە لایەکەوە بۆ ئەوەی بانگ بەرانی ئیسلام دڵنیابن کە خوا لە پشتیانەو، لەلایەکی تریشەوە با ستەمکاران چاك بزانن کە خوا هەر بۆ ماوەیەکی کەم چاوپۆشیان لێ ئەکات.

لەکۆتاییشدا نموونەیەك بۆ بتپەرستەکان دێنێتەوەو پێیان دەڵێ: پەرستراوەکانیان زۆر پەسترو لاوازترن لەوەش کەهیچ نەبێت بتوانن تاکە مێشێکیش دروست بکەن، جا پاش ئەوە داوا ئەکات کەتەنها پەیڕەوی لەدین و ئایینی ئیبراهیم بکرێ. وە بۆیە بەناوی سوورەتی (حەج)ـەوە ناونراوە،بۆئەوەی تا دنیا دنیابێت باسی ئیبراهیم و کارو کردەوەکانی هەر پرشنگداربێ، چونکە ئیبراهیم بوو ،مرۆڤەکانی بانگکرد بۆ جێبەجێکردنی فەریزەی حەج، جا هەموو خەڵك،ئەو بانگەی ئەویان بیست، تەنانەت ئەوانەش کە هێشتاهەر لەپشتی باببیاندا بوون بە: (لبیك اللهم لبیك) وەڵامیان دایەوە.

## رۆژە سەختەکانی قیامەت:

خوا لەم سوورەتەدا مرۆڤ لەکات وساتە سەختەکانی رۆژی سەلاّ هوشیار دەکاتەوەو دەفەرمویٚ: ﴿بسم الله الرحمن الرحيم * [1] يا أيها الناس اتقوا ربكم﴾ ئەی خەڵکینە! بەردەوام لەپەروەردگارتان بترسن و خۆ بپاریٚزن لە خەشم و رکی ئەو،فەرمانەکانی بەچاکی جیٚبەجیٚ بکەن، بەو جۆرە کە لەپیٚناسەی (تەقوا)دا لەلایەن یەکیٚ لەخوا ناسانەوە هاتووەو دەڵیٚت: نەچیتە جیٚگایەکەوە، خوا ڕیٚگری لیٚکردبیت، لە جیٚگایەکیشدا دەبیٚ ببی، ببەوناديار نەبیت ﴿إن زلزلة الساعة شئ عظيم﴾ چونکە بەڕاستیی بوومەلەرزەو شۆکەی هاتنی ڕۆژی قیامەت و کاولبوونی دنیا، کاریٚکی زۆر سامناك و گەورەیە، وەك خوا خۆی لەسوورەتیٚکی تردا ئەفەرمویٚ: (إذا زلزلت الأرض زلزالها وأخرجت الأرض أثقالها..)٩٩/١-٢. یان دەفەرمویٚ: (وحملت الأرض والجبال فدكتا دكة واحدة فيومئذ وقعت الواقعة..) ٦٩/١٤-١٥) ئیمامی (بوخاریی) لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا لە (ئەبی سەعید)ـەوە دەڵیٚ: پیٚغەمبەر دەفەرمویٚ: ((يقول الله تعالى يوم القيامة: يا آدمُ! فيقول: رَبَّنا لبيك وسعديك، فنادى بصوت: إن الله يأمرك أن تُخْرِجَ من ذريتك بعثاً إلى النار، قال: يارب! وما بَعْثُ النار؟ قال: من كل ألْفٍ- أراه قال- تسعُمأةٍ وتسعةٌ وتسعون، فحينئذ تَضَعُ الحامِلُ حَمْلَها ويَشُبُّ الولَدُ وترى الناسَ سكارى وماهم بسكارى ولكن عذاب الله شديد)). بەکورتیی: لەنیٚو یەك هەزار کەس دا (٩٩٩) کەسیان بۆ نیٚو ئاگر ڕەوانە دەکریٚن، لە هەزار کەس تەنیا یەك کەس ڕەوانەی بەهەشت دەکریٚ، بۆیە ئیتر لەترسانا دووگیان بەر ئەخاو، دایکی (شیردەر) بیری بەلای منداڵەکەیەوە نامیٚنیٚو خافڵ دەبیٚ.،وەکو دەفەرمویٚ: ﴿[2] يوم ترونها تذهل كل مرضعة عما ارضعت﴾ هەرکە کارەساتی ئەو ڕۆژە پیٚشهات، ئەبینن هەر ژنیٚکی شیردەر منداڵە شیرەخۆرەکەی خۆی لەکاتی شیر پیٚدانیدا فەرامۆش دەکاو لیٚی غافڵ ئەبیٚو لەباوەشی بەردەبیٚتەوە ﴿وتضع كل ذات حمل حملها﴾ وهەرچی میٚینەی دووگیان و زکپڕیشە،لەترس و لە هەیبەتا زکەکەی دادەنیٚو لەباریدەچیٚت ﴿وترى الناس سكارى﴾ و هەمووخەڵکیش وەك مەست و سەرخۆش دەبینیٚ ﴿وماهم بسكارى﴾ خۆ لەڕاستییدا مەست و سەرخۆش نین ﴿ولكن عذاب الله شديد﴾ بەڵکوسزای خوا زۆر توندوسەختە،بۆیە ئاوا بیرو هۆشیان نەماوەو، وەك سەرخۆشیان لیٚ هاتووە.

الجزء السابع عشر — سورة الحج

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

الحزب ٣٤

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمْۚ إِنَّ زَلْزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٞ ١ يَوْمَ تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّآ أَرْضَعَتْ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى ٱلنَّاسَ سُكَٰرَىٰ وَمَا هُم بِسُكَٰرَىٰ وَلَٰكِنَّ عَذَابَ ٱللَّهِ شَدِيدٞ ٢ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِي ٱللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٖ وَيَتَّبِعُ كُلَّ شَيْطَٰنٖ مَّرِيدٖ ٣ كُتِبَ عَلَيْهِ أَنَّهُۥ مَن تَوَلَّاهُ فَأَنَّهُۥ يُضِلُّهُۥ وَيَهْدِيهِ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ ٤ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمْ فِي رَيْبٖ مِّنَ ٱلْبَعْثِ فَإِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن تُرَابٖ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٖ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٖ ثُمَّ مِن مُّضْغَةٖ مُّخَلَّقَةٖ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٖ لِّنُبَيِّنَ لَكُمْۚ وَنُقِرُّ فِي ٱلْأَرْحَامِ مَا نَشَآءُ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى ثُمَّ نُخْرِجُكُمْ طِفْلٗا ثُمَّ لِتَبْلُغُوٓاْ أَشُدَّكُمْۖ وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰٓ أَرْذَلِ ٱلْعُمُرِ لِكَيْلَا يَعْلَمَ مِنۢ بَعْدِ عِلْمٖ شَيْـٔٗاۚ وَتَرَى ٱلْأَرْضَ هَامِدَةٗ فَإِذَآ أَنزَلْنَا عَلَيْهَا ٱلْمَآءَ ٱهْتَزَّتْ وَرَبَتْ وَأَنۢبَتَتْ مِن كُلِّ زَوْجِۭ بَهِيجٖ ٥

ذلك بأن — ٣٣٢

## پەیڕەوانی شەیتان:

خوای میهرەبان لەوکەسانە توورەیە کەباوەڕ بەرۆژی پەسلاّن ناکەن، بۆیە دەفەرمویٚ:﴿[3] ومن الناس من يجادل فى الله بغير علم﴾ لەگەڵ ئەوەشدا کە ڕۆژیٚکی سەختی ئاوا لە پیٚشیەتی, کەچی دەبینی هەندیٚ خەڵك بیٚهیچ بەڵگەوتیٚگەیشتن و زانیارییەك لەبارەی دەسەلاّتی خواوە ململانیٚو دەمبازی دەکەن ﴿ويتبع كل شيطان مريد﴾

وەکەویتە شوێنی هەموو شەیتانێکی یاخییەو، سەرکێش ﴿٤ کتب علیه أنه من تولاه﴾ لەسەرشەیتان بڕیار دراوەو بۆی نووسراوە: هەرکەسێك ئەو بکا بەدۆست وسەروەری خۆی ﴿فأنه یضله ویهدیه إلی عذاب السعیر﴾ بێگومان گومڕای دەکاو، بۆ سزایەکی سووتێنەرو هەڵگیرساویش ڕێنموونی دەکات، واتە:ئەنجامی بەدواداچوونیشەیتان، هەر ئاگری دۆزەخە.

## قۆناغەکانی دروستکردنی مرۆڤ:

ئەمەش نیشانەگەلێکە بۆ توانایی ودەسەلاتی خوا, لەسەر زیندوکردنەوە، خوا دەفەرموێ: ﴿٥ یا أیها الناس إن کنتم فی ریب من البعث﴾ ئەی خەڵکینە! ئەر ئێوە لەزیندوبوونەوە دوودڵ و بەگومانن ﴿فإنا خلقناکم من تراب﴾ وەرن تەماشایەکی سەرەتاو بنەڕەتیدروستبوونی خۆتان بکەن و، چاکیش بزانن:ئێمە ئەسڵتان (ئادەم)مان، لە گڵ دروستکردووە ﴿ثم من نطفة﴾ لەپاشا (نەوەکانی) لە تنۆکە ئاوێك،کە لەپشتی باوك هەڵدەقوڵێ ﴿ثم من علقة﴾ ئینجا لە خوێنپارەیەك وەك زەروو ﴿ثم من مضغة﴾ پاشان لەگۆشتپارەیەك ﴿مخلقة وغیر مخلقة﴾ تەواوو سەرو سیما پێدراو، یا ناتەواوو، پێش تەواو بوون لەبار دەچێ ﴿لنبین لکم﴾ تا دەسەلاتی خۆمانتان بۆ دەرخەین و، تێبگەن کە دەسەلاتێك بتوانێت ئەوئاوە – نوتفە – یە بکا بەپارچە خوێنێك، پاشان بەپارچە گۆشتێك، لەوێیشەوە بۆ ئادەمزاد، دیسان هەرئەو دەسەلاتەیە دەتوانێت زیندووتان بکاتەوە، بەڵکو زۆر بەئاسانتر ﴿ونقر فی الأرحام ما نشاء﴾ ئینجا چیمان بوێ دەیخەینە منداڵدانەوەو هەر لەوێش بڕیاری لەسەر دەدەین و دەیهێڵینەوە تا دیمەن و نیگاری تەواو ئەبێت ﴿إلی أجل مسمی﴾ تاکاتی دیاریکراو بۆلەدایکبوونی لەوێ ڕایدەگرین ﴿ثم نخرجکم طفلا﴾ لەپاشان بەساوایی‌و زۆرلاوازو بێ دەسەلات لەو منداڵدانەدا دەتان هێنینە دەرێ! ﴿ثم لتبلغوا أشدکم﴾ لەپاشان پەروەردەتان دەکەین تا وردە وردە دەگەنە هێزو پێزی تەواوتان و، بیرو هۆشتان کامڵ دەبێ ﴿ومنکم من یتوفی﴾ وهەتانە هەر لەسەرەتای ژیانەوە دەمرن و ئەوەندە نامێنیننەوە ﴿ومنکم من یرد إلی أرذل العمر﴾ و هی وایشتان هەیە دەمێنێ‌و تەمەنی درێژ دەبێ تا دەگاتە کەلەلاییوسەخترین پلەی ژیانیی‌و، بەتەواوی کەنەفت و ئوفتادەو پیردەبێ ﴿لکی لایعلم من بعد علم شیئا﴾ تاوای لێدێت پاش ئەوەی کاتی خۆی شتێکی دەزانی، ئێستا هەمووشتێکی لەبیردەچێتەوە. بەڵێ مەتەڵی چۆنیەتی دروستبوونی ئادەمیی بۆکێ هەڵدێت؟ کێیە؟ لەکوێوە هات؟ چۆن پەیدابوو؟ چەن قۆناغی بڕی؟ قورئان بەکورتەیەك وەڵامی ئەوگشتە مەتەڵە بەم شێوەیە ئەداتەوە:

١) لەسەرەتاوە لەخاك وخۆڵ ئافەرێنرا، کەوابووئینسان ڕۆڵەی زەوییەو، لەزەویی لەدایك بووە، لەسەرپشتی ئەوپێگەیشتووەو ژیاوە، هەموو توخمەکانی لەگەڵ زەویدا چوون یەکن، مەگەر تەنیا (ڕۆح) جیایان بکاتەوە، بەلاّم ئەی ئەو گڵە لەکوێ بوو؟ ئەو هەموو گەردیلانە چۆن کۆکرانەوە؟ چ زاتێك کۆی کردنەوە؟.

٢) هەرلەو دڵۆپە ئاوە (نوتفە)یە.. بەڵێ هەر لەوئاوەی ژن وپیاوە، کە تەنها دڵۆپێکەو، بەسەدانیش ملیۆن حەیوانی مەنەویی هەڵگرتووە.. تەنها(خەلیە) یەك لەوملیۆنەها خەلیە، لەگەڵ ئاوی ژندا موتوربە دەبێ و لەمنداڵداناو لەجێگایەکی قایم وئەستووردا قەرار دەگرێ.. پاشان هەر لەو دڵۆپە بچووکە ئاوەیە، ڕەنگیی، جوانیی و ناشیرینی، قەدو باڵا، قەڵەویی ولاوازیی، ئازایەتیی و جوامێریی، بێ وەرەیی و ترسنۆکیی، زیرەکیی و بلیمەتیی، تەمەڵی و کەودەنیی هەڵدەگرێت.. هتد.

٣) خوێنپارە.

٤) گۆشتپارە.

پاشان پەیكەری ئێسكیی (الهیكل العظمی).. دواتر قۆناغەكانی منداڵیی و، ئینجا پیر بوون و گەڕانەوە بۆ قۆناغی منداڵیی، بەشێوەیەك كەهیچ شتێك نەزانێ، لەڕابردووی خۆی، جا باشە ئەبێ كێ بێت ئەم هەموو قۆناغانە بەسەر مرۆڤدا بێنێ؟ دەبێ بۆچی مرۆڤ خۆی لەبیرباتەوە، تا بەئاسانی خوای خۆی بدۆزێتەوە؟

﴿وترى الأرض هامدة﴾ بەڵگەیەكی تری دەسەڵاتمان بۆ زیندوو كردنەوەتان: لەوەرزی زستاندا ئەم زەوییە وشك و مردووەیە،دەبینی كە هیچ گژو گیایەكی تیا نیەو خامۆش و بێ هەست و خوست ﴿فإذا انزلنا علیها الماء﴾ كەچی هەركە ئاوی بارانی بەسەردا دەبارێنین ﴿اهتزت وربت﴾ رادەچەنێ و دەبزوێ و بەجووڵە دەكەوێ و ئەژیەتەوە و بەخۆدا دێ و گەشە دەكا ﴿وانبتت من كل زوج بهیج﴾ و لە هەمووجۆرە گژو گیایەكیجوان دەڕوێ ﴿٦ ذلك بأن الله هو الحق﴾ دروستكردنی ئادەمیزاد بەو جۆرەو، زیندووكردنەوەی زەوییش بەو شێوەیە، هەر هەموو بۆ ئەوەیە ئێوە بیر بكەنەوەو چاك بزانن كە بەڕاستیی تەنها خوا زاتێكی ڕاست و هەقە ﴿وانه یحی الموتی﴾ وبێگومان هەرئەویشە مردووان زیندوو ئەكاتەوە ﴿وانه علی كل شئ قدیر﴾ وهەر ئەوە بەسەر هەموو شتێكدا بەتوانایە ﴿٧ وان الساعة آتیة لا ریب فیها﴾ دڵنیابن قیامەتیش بەرپا دەبێت، كەهیچ گومانی تێدا نیە. ﴿وان الله یبعث من فی القبور﴾ و بەڕاستیی خوا هەموو ئەوانەی لەگڵكۆ گۆڕدان زیندوو ئەكاتەوە، تاپاداشت و تۆڵەیان وەرگرنەوە، لەسوورەتی(یاسین)یشدا دەفەرموێ: (قل یحییها الذی انشأها اول مرة..)٣٦/٧٩. كەچی لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگانەدا: ﴿٨ ومن الناس من یجادل فی الله﴾ لەنێو خەڵكیدا مرۆڤی وا هەیە -دەربارەی زاتی خواو، دەسەڵاتی فراوانی- موجادەلەو شەڕە قسە دەكات!! ﴿بغیر علم ولا هدی ولا كتاب منیر﴾ بێ ئەوە هیچ جۆرە زانست و زانیاریی و ڕێنموونیی و نامەیەكی ڕوون و ئاشكرای ببێت، كەواتە زۆر جێگەی سەر سوڕمانە لەگەڵ ئەو هەموو نیشانەو بەڵگانەدا هەر ملە ملێ و چەلەحانێ لەگەڵ خوادا بكات!.

الجزء السابع عشر — سورة الحج

ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡحَقُّ وَأَنَّهُۥ يُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰ وَأَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ (٦) وَأَنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٞ لَّا رَيۡبَ فِيهَا وَأَنَّ ٱللَّهَ يَبۡعَثُ مَن فِي ٱلۡقُبُورِ (٧) وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِي ٱللَّهِ بِغَيۡرِ عِلۡمٖ وَلَا هُدٗى وَلَا كِتَٰبٖ مُّنِيرٖ (٨) ثَانِيَ عِطۡفِهِۦ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۖ لَهُۥ فِي ٱلدُّنۡيَا خِزۡيٞۖ وَنُذِيقُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ عَذَابَ ٱلۡحَرِيقِ (٩) ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتۡ يَدَاكَ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيۡسَ بِظَلَّٰمٖ لِّلۡعَبِيدِ (١٠) وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَعۡبُدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ حَرۡفٖۖ فَإِنۡ أَصَابَهُۥ خَيۡرٌ ٱطۡمَأَنَّ بِهِۦۖ وَإِنۡ أَصَابَتۡهُ فِتۡنَةٌ ٱنقَلَبَ عَلَىٰ وَجۡهِهِۦ خَسِرَ ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةَۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡخُسۡرَانُ ٱلۡمُبِينُ (١١) يَدۡعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُۥ وَمَا لَا يَنفَعُهُۥۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلضَّلَٰلُ ٱلۡبَعِيدُ (١٢) يَدۡعُواْ لَمَن ضَرُّهُۥٓ أَقۡرَبُ مِن نَّفۡعِهِۦۚ لَبِئۡسَ ٱلۡمَوۡلَىٰ وَلَبِئۡسَ ٱلۡعَشِيرُ (١٣) إِنَّ ٱللَّهَ يُدۡخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَفۡعَلُ مَا يُرِيدُ (١٤) مَن كَانَ يَظُنُّ أَن لَّن يَنصُرَهُ ٱللَّهُ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ فَلۡيَمۡدُدۡ بِسَبَبٍ إِلَى ٱلسَّمَآءِ ثُمَّ لۡيَقۡطَعۡ فَلۡيَنظُرۡ هَلۡ يُذۡهِبَنَّ كَيۡدُهُۥ مَا يَغِيظُ (١٥)

٣٣٣

**رابەرانی كوفر بە فیزەوە مل بە لاوە دەنێن:**

حاشاكەرانی دین ودینداری, هەمیشە ئەمە باوو نەریتیانە كە ئەم ئایەتە باسی دەكاو دەفەرموێ:﴿٩ ثانی عطفه﴾ هەریەكە لەو جۆرە كەسانە بەفیزەوە مل بەلاوەدەنێو لەئاستی هەق ڕوو وەردەگێڕێ، واتە: لەهەق و ڕاستیی لا دەداو بەردەوام بەرەو بێ بڕوایی‌مل دەنێت، وەك لەئایەتی تردا هاتووە: (وفی موسی إذ ارسلناه إلی فرعون بسلطان مبین فتولی بركنه..)٥١/٣٩. یاخود وەك دەفەرموێ: (رایت المنافقین یصدون عنك صدودا). یان دەفەرموێ: (واذا قیل لهم تعالوا یستغفر لكم رسول الله لووا رؤسهم ورایتهم یصدون وهم مستكبرون). ﴿لیضل عن سبیل الله﴾ تاخۆی و خەڵكیش لەرێ و ڕێبازی خوا چەواشەو لاڕێ بكات ﴿له فی الدنیا خزی﴾ لەدونیادا

بەشیئەوە، هەر ڕیسوایی وسەرشۆڕییە ﴿ونذیقه یوم القیامة عذاب الحریق﴾ و لەڕۆژی قیامەتیشدا لەئێوە سزای سووتێنەری پێ ئەچێژین ﴿[10] ذلك بما قدمت یداك﴾ پێی ئەوترێ: ئەو تۆڵەیە لەئەنجامی ئەو کارەدایە کە بەهەردوو دەستت پێشی خۆتت خستووە و کردووتە لەدونیادا ﴿وأن الله لیس بظلام للعبید﴾ بەڕاستیی خواش هەرگیزستەم ناکا لەبەندەکانی خۆی.

## هەیە بە دوودڵیی خوا دەپەرستێ:

گەلێ لەمەردم بەشێوەیەکی سادەونەبەدڵ خوادەپەرستێ: وەکو دفەرموێ: ﴿[11] ومن الناس من یعبد الله علی حرف﴾ هەندێ خەڵك هەیە دوودڵەو، هەر بەشێوەیەکی زارەکی خوا پەرستی ئەکات ومتمانەو بڕوای تەواوی بە خوای گەورە نیە ﴿فإن أصابه خیر اطمأن به﴾جا گەرهاتوو خێرو چاکەیەکی تووشهات، واتە:ئەو ساڵە مەڕو ماڵات و دەغڵ و دانەوێڵەکەی بەئارەزووی ئەو بوو، ئەوا بەخوا پشت ئەستوور ودڵنیا دەبێ و ئەڵێ: ئاییینی ئیسلام ئایینێکی زۆر بەپیت وپیرۆزە ﴿وإن أصابته فتنة﴾ وخۆ ئەگەر گرفتار بوو بەڵایەکی ئەوقە بوو﴿انقلب علی وجهه﴾ ئەوا سواری سەری خۆی دەبێ و" وەرئەگەڕێتەوەو ئەڕواتەوە سەر باری خراپی پێشووی خۆیی و، سەنگەری خەبات دەگوێزێتەوە! ﴿خسر الدنیا والآخرة﴾ ئابەو جۆرە دونیاو پاشەڕۆژیشی لەدەست خۆی دا، لەدونیادا دەستەو تاقمەکەی خۆی بڕوایان پێی نەماو دۆڕانی، لەدواڕۆژیشدا ئەڕواتە ناو دۆزەخەوە ﴿ذلك هو الخسران المبین﴾ هەر ئەویشە دووسەرە زەرەرو زیانی زەق و ڕوون و ئاشکرا!! بەڵێ.. پێش چاوگرتنی زیان و قازانج بۆ ماڵ و سامان و بازرگانی دەست ئەدات، بەڵام بۆ عەقیدەو ئایدیالۆژی و خواپەرستیی هەرگیز دەست ناداو ناگونجێت، نابێ لەسەر حسابی قازانج و زیان عەقیدە وەر بگیردرێ و خواپەرستیی بکرێ ﴿[12] یدعو من دون الله مالا یضره وما لا ینفعه﴾ لەباتی خوا هاناو هاوار لە شتێك ئەكات كە نە ئەتوانێ زیانێکی لێ بدات، نە ئەشتوانێ قازانج و کەڵکێکی پێ بگەیەنێ، سەرگەردان و بەدبەختەو نازانێ بۆ کوێ بڕوات..؟ سەرلێشێواوە، چونکە یا بتێك ئەپەرستێ، وەیان گرووپ و لایەنێ، یا کەسێك، یا بەرژەوەندییەك، هەروەك ئێستا پەیرەو دەکرێت!!﴿ذلك هوالضلال البعید﴾ ئەوحاڵەتەیە لاڕێی و گومڕاییەکی دوور لە ڕێنماییە ﴿[13] یدعو لمن ضره أقرب من نفعه﴾ شتێ ئەپەرستێ و هاواری لێ دەکا، هەمیشە زەرەرو زیانەکەی نزیکترە لەقازانجی ئەوە بۆدونیاکەی، وە لەقیامەتیشدا زەرەرو زیانی حەتمیی مسۆگەرە ﴿لبئس المولی ولبئس العشیر﴾ ئای چ یارمەتیدەرێکی خراپە و، چ هاودەم و هاوڕێیەکی بەد فەرەئەوشەیتانە، یان ئەو کەسە، یان ئەو گرووپە کەکاتی خۆی ئەمی لەخشتە بردووە. ئینجا پاش باسکردنی بەختی بێبەختان، باسی بەختی بەختداران ئەکا، ئەفەرموێ: ﴿[14] إن الله یدخل الذین آمنوا وعملوا الصالحات جنات تجری من تحتها الأنهار﴾ بێگومان ئەو کەسانەی بڕوایان هێناوەو کارو کردەوە چاکەکانیان ئەنجام داوە خوا دەیانباتە ناو باخ و باخاتی بەهەشتەوە کە جۆگەو ڕووبارو چۆم لەبەر درەختەکانیدا دێت و دەڕوا ﴿إن الله یفعل ما یرید﴾ بەڕاستی خوا هەرچۆنێکی بوێ ئەیکات.

## خۆشتان بخنکێنن، خوا پێغەمبەرهەر سەردەخات:

﴿[15] من کان یظن أن لن ینصره الله فی الدنیا والآخرة﴾ هەرکەسێك وەك (ئیبن عەباس) ئەڵێ: پێی وایە کە خوا هەرگیزلەدنیاو لەقیامەت،یارمەتی پێغەمبەرەکەی خۆی موحەممەد ﷺ ناداو سەری ناخات ﴿فلیمدد بسبب إلی السماء ثم لیقطع﴾ دەبا گوریسێك بێنێ وبە میچی خانووەکەی خۆیەوە خۆی پێ هەڵواسێ، لەپاشا خۆی پێبخنکێنێ ﴿فلینظر هل یذهبن کیده ما یغیظ﴾ ئینجابا بزانێت ئەو هەمووڕق وتووڕەیی و ناڕەحەتی دڵی

دەڕوات؟ چونکە خوا یارمەتی لە پێغەمبەری خۆی ﷺ نابڕێ، دەبا ئەویش لەڕقا خۆی بتاسێنێت ﴿[١٦] وكذلك انزلناه آيات بينات﴾ وەك ئەو دابەزاندنە ئابەو شێوە پڕ لە حیکمەت و ڕەوانبێژییە، ئەم قورئانەمان ناردەخوار، کە ئایەتەکانی ڕۆشن و ئاشکران ﴿وان الله يهدى من يريد﴾ و بێگومان هەرکەسێك کە خوا خۆی بیەوێ و شایستەش بێت، ئەوا بەم قورئانە بەرەوخۆی ڕێنوێنی دەکات، چونکە خۆیچاك ئەزانێ ئەو کەسە چی هەڵئەگرێ، وەك خۆی ئەفەرمووێ: (لايسأل عمايفعل وهم يسألون). ﴿[١٧] إن الذين آمنوا﴾ بێگومان ئەو کەسانەی کە بڕوایان هێناوە ﴿والذين هادوا﴾ ئەوانەش بوونە جوولەکەو شوێنکەوتەی موسا ﴿والصابئين﴾ و ئەوانەش (سوببیی)ین و لایان داوەو ئەستێرە، یافریشتە پەرستن ﴿والنصارى﴾ و ئەوانەش شوێنکەوتەی عیسان و مەسیحین ﴿والمجوس﴾ و ئەوانەش زەردەشتیی وئاگرپەرستن ﴿والذين اشركوا﴾ و ئەوانەش کە هاوبەشیان بۆ خوا دانا ﴿إن الله يفصل بينهم يوم القيامة﴾ بێگومان خوای هەق لەڕۆژی دوایی و سەلادا، بەکاری هەمووان ڕادەگاو داوەرییان دەکا بڕوادارەکانیان ئەنێرێ بۆ بەهەشت و، ئەوانی تریش ئەنێرێ بۆ دۆزەخ. (قەتادە) ئەڵێت: ئایینەکان شەشن، پێنجیان بۆ شەیتان کارو کۆشش ئەکەن و باتڵن، ئەوی دیکەش - کە بڕوا بوونە تەنها بەم ئیسلامە - بۆ خوایەو حەقە ﴿إن الله على كل شئ شهيد﴾ بەڕاستیی خوا بەسەر هەموو شتێکدا شایەدو ئاگادارەو ئەزانێ چی ئەکەن، کەواتە ئەوانە هەرچی ئەکەن، با بیکەن لەخوا شاراوە نابێ. (بۆزیاتر ئاگاداربوون لە ئایین و ڕشتەی (سوببیی) تەماشای ئایەتی ٦٢ سوورەتی بەقەرە بکە).

وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَٰهُ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ وَأَنَّ ٱللَّهَ يَهْدِى مَن يُرِيدُ ﴿١٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَٱلَّذِينَ هَادُوا۟ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلْمَجُوسَ وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿١٧﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَسْجُدُ لَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ وَٱلنُّجُومُ وَٱلْجِبَالُ وَٱلشَّجَرُ وَٱلدَّوَآبُّ وَكَثِيرٌ مِّنَ ٱلنَّاسِ ۖ وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيْهِ ٱلْعَذَابُ ۗ وَمَن يُهِنِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّكْرِمٍ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْعَلُ مَا يَشَآءُ ۩ ﴿١٨﴾ ۞ هَٰذَانِ خَصْمَانِ ٱخْتَصَمُوا۟ فِى رَبِّهِمْ ۖ فَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ قُطِّعَتْ لَهُمْ ثِيَابٌ مِّن نَّارٍ يُصَبُّ مِن فَوْقِ رُءُوسِهِمُ ٱلْحَمِيمُ ﴿١٩﴾ يُصْهَرُ بِهِۦ مَا فِى بُطُونِهِمْ وَٱلْجُلُودُ ﴿٢٠﴾ وَلَهُم مَّقَٰمِعُ مِنْ حَدِيدٍ ﴿٢١﴾ كُلَّمَآ أَرَادُوٓا۟ أَن يَخْرُجُوا۟ مِنْهَا مِنْ غَمٍّ أُعِيدُوا۟ فِيهَا وَذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ﴿٢٢﴾ إِنَّ ٱللَّهَ يُدْخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٍ وَلُؤْلُؤًا ۖ وَلِبَاسُهُمْ فِيهَا حَرِيرٌ ﴿٢٣﴾

**بوونەوەر سەرجەم سوژدە بۆ خوا دەبات:**

﴿[١٨] الم تر ان الله يسجد له من فى السموات ومن فى الأرض﴾ ئاخۆ نەتزانیوەکە هەرچی لەئاسمانەکان و، لە زەوییدایە، سەرجەم هەموو بۆخوا سوژدە دەبەن؟ ﴿والشمس والقمر والنجوم والجبال والشجر والدواب﴾ خۆرو هەیڤ و ئەستێرەو کێوەکان و درەخت و جفۆك و خزۆکیش، دیارە هەندێك لەو خەڵکە خۆر پەرستبوون، بۆیە لەسوورەتی (٤١/٣٧) ئەفەرموێ: (لا تسجدوا للشمس ولا للقمر واسجدوا لله الذى خلقهن إن كنتم إياه تعبدون). لە فەرموودەیەکی (متفق عليه) یشدا هاتووەکە: (ئەبو زەڕ) ئەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((اتَدْرِى أيْنَ تَذْهَبُ هذه الشمسُ؟)) ئایادەزانی ئەم خۆرە پاش ئاوا بوونی چی لێدێ و بۆکوێ دەچێت؟ دەڵێ: گوتم: نەخێر، بەڵکو خوا باشتر دەزانێ، ئەویش فەرمووی: ((فإنها تذهب لِتَسْجُدَ تحت العرش، ثم تَسْتَأذِنُ يُوشِكُ ان يقال لها: إرجعى مِنْ حَيْثُ شِئْت)). دەڕوا لەبن (عەرش)دا سوژدە دەبا بۆ خوا، پاشان لەخوا داوای مۆڵەتی گەڕانەوە دەکات، نزیکە پێی بگوترێ: بگەڕێوە بۆ هەر جێگایەك کەدەتەوێ. (عەمری کوڕی عاس) ئەڵێ: پێغەمبەر ﷺ باسی پازدە سوژدەی قورئانی بۆ کردم، سیانیان لە (حزب المفصل)دان کە لە

سوورەتی (ق)ـەوە دەست پێدەکا، بۆ کۆتایی قورئان، دوانیشیان لە سوورەی (حەج)دان. (ئەبی داود، ئبن ماجە) ڕیوایەتیان کردووە. ﴿وكثير من الناس﴾ وە زۆرێکیش لە مەردوم! بەئارەزووی خۆی و بەپێخۆشبوونی خۆی سوژدە هەربۆخوا دەبا ﴿وكثير حق عليه العذاب﴾ زۆرێکیشیان لاڕێ دەگرن و، سزای خوایان لەسەر شایستەو پێویست بووە ﴿ومن يهن الله فما له من مكرم﴾ خوا هەرکەسێك بێ ڕێزو سووکی بکات (بەهۆی لاساری خۆیەوە)، واتە: هەر لەئەزەلدا لای خوا بێ بڕواو شەقیی بێت ئیتر هیچ کەسێك ناتوانێ ڕێزی لێ بنێت و بەرەو بەختیاریی بیهێنێتەوە ﴿إن الله يفعل ما يشاء﴾ بەڕاستی خوا هەرشتێکی ئارەزووبێ ئەیکات، سزای کێ بدات.. میهرەبانی لەگەڵ کێ بکات.

**ئیماندارو خوانەناس:**

ئینجا دیمەنێکی سەختیی ڕۆژی قیامەت نیشان ئەدات، تا لەوێ ڕێزدارو بێ ڕێز دەرکەوێ،وەکو دەفەرموێ:﴿[١٩] هذان خصمان﴾ ئەمانەی کە باسکران دوو دەستەی ناحەزو دژ بەیەکن، بڕوادارو بێ بڕوا ﴿اختصموا في ربهم﴾ لەسەر پەروەرندەی خۆیان کێشمە کێشم وقرەقرپیانە, بڕوادارەکان دیفاع و بەرگرییان لەئاییینی خوا دەکردو، بێ بڕوایانیش ویستیان ئاییینی خوا بەفووی دەمیان بکوژێننەوە!!﴿فالذين كفروا قطعت لهم ثياب من نار﴾ جا ئەوانەیکافرو بێبڕوابوون, جل وبەرگ و پۆشاکی ئاگریان بۆبڕاوە, بەئەندازەی قەدو باڵای خۆیان ﴿يصب من فوق رؤسهم الحميم﴾ ئاوی کوڵ بەکوڵیشیان لەسەروەوە بەسەرا دەکرێ ﴿[٢٠] يصهر به ما في بطونهم والجلود﴾ هەربەوئاوە ناوسکیان و پێستیان ئەتوێنرێتەوەو دەبێتە ئاو و دێتە خوارەوە، پێستەکەشیان هەموو لەتاو گەرمای ئەو ئاوەدا دەبڵۆخێ. ﴿[٢١] ولهم مقامع من حديد﴾ بەرگورزی ئاسنیش دەدرێن ﴿كلما أرادوا أن يخرجوا منها من غم﴾ هەر کاتێکیش گەرەکیان بێ کە لێی دەرچن لە خەم وخەفەتاندا ﴿أعيدوا فيها﴾ ئەگەڕێنرێنەوە بۆ ناویی‌و قەتیش ڕزگاریان نابێ ﴿وذوقوا عذاب الحريق﴾ بۆ ئەوەی زیاتریش ئێشیان پێ بگات، پێیان ئەوترێ: دەی سزای سووتێنەر بچێژن، ئەمە پاداشت و تۆڵەی بێ بڕوایان بوو، ئەمەیش پاداشتی بڕوادارانە کەدەفەرموێ: ﴿[٢٣] إن الله يدخل الذين آمنوا وعملوا الصالحات جنات تجري من تحتها الأنهار﴾ بەڕاستیی ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کارە چاکەکانیان کردووە، خوا ئەیانباتە ناو چەند باخ و باخاتێکی بەهەشتەوە کە بەبنکی دارو درەختەکانیدا چەندین ڕووبارو چۆماو دێت ودەڕوا ﴿يحلون فيها من أساور من ذهب و لؤلؤا﴾ خشڵدار دەکرێن لەوێدا بە بازنی زێڕو مرواری ﴿ولباسهم فيها حرير﴾ و جل وبەرگی ئەوێشیان هەورێشمە، ئینجا بەهۆی دەرکەوتنی سەر ئەنجامی هەردوو لایانەوە - بڕواداران بۆ بەهەشت و، بێ بڕوایانیش بۆ دۆزەخ -. ئەم وانەیەش پێشکەش دەکرێت: ﴿وهدوا إلى الطيب من القول﴾ بەرەو قسەی جوان و وتەی شیرین ڕێنوێنی کراون کەوشەی (لا إله إلا الله)یە ﴿[٢٤] وهدوا إلى صراط الحميد﴾ هەروەها ڕێنوێنی کراون بۆ ڕێگەی پەسەندی خوا.

**ئەوانەڕێ لە ماڵی خوا دەگرن:**

﴿[٢٥] إن الذين كفروا ويصدون عن سبيل الله والمسجد الحرام﴾ بەڕاستی ئەو کەسانەش خوا نەناس و بێ باوەڕن و، هێمان بڕوادارانیش لەڕێگاو ڕێبازی خوا دەگێڕنەوەو، دەبنە لەمپەر لەمزگەوتی (حەرام)و ناهێڵن زیارەتی ئەومزگەوتە بکەن، تووشی جەزرەبە دەبن ﴿الذي جعلناه للناس سواء العاكف فيه والباد﴾ ئەومزگەوتەی کە کردوومانە بە زیارەتگەو پەرستگە بۆ تەواوی خەڵکیی، چ ئەوانەی نیشتەجێی مەککەن و، چ ئەوانەش لەشوێنانی

دوورەوە بۆی دێن ﴿ومن يريد فيه بإلحاد بظلم﴾ وە هەرکەسێك لەمزگەوتی (حەرام) لەڕێی ڕاست لا بداو کاری ناپەسەند بکا, هاوبەش بۆ خوا پەیدا بکا ﴿نذقه من عذاب اليم﴾ سزایەکی زۆر ئێش پێگەیەنەری پێ دەچێژین.

**دروستکردنی کابەو بانگەوازی حەج:**

﴿[٢٦] وإذ بوأنا لإبراهيم مكان البيت﴾ ئەی پێغەمبەر ﷺ بێنەوە بیر ئەوکاتە کە (ئیبراهیم) مان لە جێگای (کابە) دا ئەنواداو تێمانگەیاند کە لەکوێدا دروستی بکات، واتە: ئەم (بەیتە) کە ئێستا ئەوان بتی تیا ئەپەرستن، هەر ئەو کاتە جێگای یەکتاپەرستیی بووە و، خۆمان دیارییمان کردووە ﴿أن لا تشرك بي شيئا﴾ وتیشمان بەئیبراهیم: هیچ شتێك مەکە بەهاوەڵ و هاوبەشی من ﴿وطهر بيتي للطائفين والقائمين والركع السجود﴾ وە ماڵەکەم بۆ تەواف کاران و نوێژکەران و ڕکوع بەران و سوژدە بەران پاك بکەوە، واتە: لە (کابە)دا تەنها جێگای ئەوانە دەبێتەوە، نەك ئەوانەی بتی تیا ئەپەرستن، ﴿[٢٧] واذن في الناس بالحج﴾ ئەی ئیبراهیم! ﷺ جاڕی حەج بدە بەناو خەڵکدا, واتە: جاڕبدە بابێن بۆ زیارەتی کابە بەنیازی حەجەوە، جا بۆ دڵنیایی ئیبراهیم و گەیشتنی بانگەکەی بەمەردوم ئەفەرمووێ: ﴿يأتوك رجالا﴾ بەپیادەیی دێن بۆلات ﴿وعلى كل ضامر يأتين من كل فج عميق﴾ وە لەسەر پشتی هەموو وشترێکی لاواز,لەبەر ئەوە کە لە ڕێگا دوور و درێژەکانەوە دێن بۆ حەج.

**بەهرەو قازانجەکانی حەج:**

﴿[٢٨] ليشهدوا منافع لهم﴾ تا ئەوان ئامادەی گەلێ لە کەڵکەکانی دونیاو دواڕۆژیان بن. واتە: ئامادە بوون لەو جێگەدا کەڵکی ئاینی ودنیایی تیایە.هەموو کەڵکێکی بازرگانیی و کۆمەڵایەتیی و ئابووریی تیایە ﴿ويذكروا اسم الله في ايام معلومات﴾ وە لە ڕۆژانێکی زانراودا واتە: لە ڕۆژەکانی قوربانی کردندا با یادی خوا بکەن و بڵێن (لبيك اللهم لبيك).﴿على ما رزقهم من بهيمة الأنعام﴾ لەسەر سەربڕینی ئەو وشترو مەڕوماڵاتانە خوا پێیانی داوە واتە: با لەکاتی سەربڕینی حەیوانی قوربانیدا تەنیا ناوی خوا بێنن ﴿فكلوا منها﴾خۆتان لەگۆشتی ئەو ئاژەڵی قوربانیە بخۆن ﴿واطعموا البائس الفقير﴾ و بەشی ئەوانەشی لێ بدەن کە برسیەتییان پێوە دیارەو تامەزرۆن، ئەوانەش کە پێوەیانەوە دیار نیە، (هەژاران و نەداران) هەموویان لێی بخۆن ﴿[٢٩] ثم ليقضوا تفثهم﴾ لەپاشا با ئیحرامەکەیان لەخۆیان بکەنەوەو سەریان بتاشن و، نینۆك بکەن و چڵك و چەپەڵیش لەخۆیان بکەنەوە، دیارە ماوەی ئیحرام تۆزو چڵك و چەپەڵییان لێ دەنیشێت جا دوای شکاندنی ئیحرامەکەیان پاك و خاوێنی خۆیان ئەکەن ﴿وليوفوا نذورهم﴾ هەروەها نەزرەکانیان جێبەجێ بکەن "نەزری حەج و دیاریی" ﴿وليطوفوا بالبيت العتيق﴾ و باتەوافی ماڵی دێرین و پارێزراوی خوا بکەن: (طواف الإفاضة). ئیمامی (ترمزیی) ئەم فەرموودەیەی هێناوەو دەڵێ: ((إنما سمی البیت:

الجزء السابع عشر　　سورة الحج

وَهُدُوٓاْ إِلَى ٱلطَّيِّبِ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ وَهُدُوٓاْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡحَمِيدِ
﴿٢٤﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلۡمَسۡجِدِ
ٱلۡحَرَامِ ٱلَّذِي جَعَلۡنَٰهُ لِلنَّاسِ سَوَآءً ٱلۡعَٰكِفُ فِيهِ وَٱلۡبَادِۚ
وَمَن يُرِدۡ فِيهِ بِإِلۡحَادِۭ بِظُلۡمٖ نُّذِقۡهُ مِنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ ﴿٢٥﴾
وَإِذۡ بَوَّأۡنَا لِإِبۡرَٰهِيمَ مَكَانَ ٱلۡبَيۡتِ أَن لَّا تُشۡرِكۡ بِي
شَيۡـٔٗا وَطَهِّرۡ بَيۡتِيَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلۡقَآئِمِينَ وَٱلرُّكَّعِ
ٱلسُّجُودِ ﴿٢٦﴾ وَأَذِّن فِي ٱلنَّاسِ بِٱلۡحَجِّ يَأۡتُوكَ رِجَالٗا وَعَلَىٰ
كُلِّ ضَامِرٖ يَأۡتِينَ مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٖ ﴿٢٧﴾ لِّيَشۡهَدُواْ
مَنَٰفِعَ لَهُمۡ وَيَذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ فِيٓ أَيَّامٖ مَّعۡلُومَٰتٍ
عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلۡأَنۡعَٰمِۖ فَكُلُواْ مِنۡهَا وَأَطۡعِمُواْ
ٱلۡبَآئِسَ ٱلۡفَقِيرَ ﴿٢٨﴾ ثُمَّ لۡيَقۡضُواْ تَفَثَهُمۡ وَلۡيُوفُواْ
نُذُورَهُمۡ وَلۡيَطَّوَّفُواْ بِٱلۡبَيۡتِ ٱلۡعَتِيقِ ﴿٢٩﴾ ذَٰلِكَ وَمَن
يُعَظِّمۡ حُرُمَٰتِ ٱللَّهِ فَهُوَ خَيۡرٞ لَّهُۥ عِندَ رَبِّهِۦۗ وَأُحِلَّتۡ
لَكُمُ ٱلۡأَنۡعَٰمُ إِلَّا مَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡۖ فَٱجۡتَنِبُواْ
ٱلرِّجۡسَ مِنَ ٱلۡأَوۡثَٰنِ وَٱجۡتَنِبُواْ قَوۡلَ ٱلزُّورِ ﴿٣٠﴾

٣٣٥

العتيق، لأنه لم يظهر عليه جبار)) بەڵێ هەر لەو کاتەوە ئەو بانگە دراوە تا ئێستا مەردوم دوور ونزیك بەهەزاران کیلۆمەتر بەرەو کابە ئەڕۆن و ئامادەی ئەو هەموو کەڵك و قازانجە ئەبن.. حەج عیبادەتێکی جەماعی ساڵانەیە، وە گەلێ سودو قازانجی مەعنەوی ومادی تێدایە بۆئەوانەی ئامادە دەبن بۆ ئەنجامدانی ئەو فەیزە گەورەیە.

**ڕێزگرتن لەو شیعارانە خوا دایناون:**

﴿[٣٠] ذلك ومن يعظم حرمات الله﴾ بەرنامەی حەج ئاوایە (کە باسکرا)، جا تۆیش بەتوندی ئەو بەرنامەیە بگرەو کاری پێ بکە، شیاوی باسیشە هەرکەسێك ڕێز لە فەرمانەکانی خوا بگرێ و بەگەورەیان دانێ و لەگوناه خۆی بپارێزێ ﴿فهو خير له عند ربه﴾ئەوە لای پەروەردگاری بۆی چاکترە. موشریکەکان هەندێ شتیان لەسەر خۆیان حەرام و یاساغ کردبوو، وەك (بەحیرەو، سائیبەو، وەصیلەو، حامی..) کە خوا حەڵاڵی کردبوون وەك ئەفەرموێ: ﴿واحلت لكم الأنعام إلا ما يتلى عليكم﴾ گۆشتی وشترو گاو مەڕو بزنیشتان بەهەموو جۆرەکانیەوە بۆ حەڵاڵ کراوە، ئەوە نەبێت "لەقورئاندا" یاسای حەرامیەتی بۆتان ئەخوێنرێتەوە، وەك لەئایەتی: (حرمت علكم الميتة والدم..)دا حەرامکراوەکان باسکراون، ئیتر ئێوە بۆتان نییە بەئارەزووی خۆتان حەڵاڵ و حەرام بکەن و، یاسای ژیان دابنێن ﴿فاجتنبوا الرجس من الأوثان﴾ بت پەرستن شتێکی زۆر بێ نرخ و پیسە، سەربڕینی ئاژەڵ بۆیان پیسە، جا کەوایە ئێوەش لە بتان خۆ دوور بگرن، چونکە پیسن ﴿واجتنبوا قول الزور﴾ هەروەها هاوەڵ دانان بۆ خوا درۆیەکی گەورەیە، کەوایە لە هەموو گوتارو وتەیەکی درۆو نابەجێ و هەڵبەستراویش دوور بگرن، شایەتیدانی درۆینەش کەمتر نیيە لە شیرك، وەك لەم فەرمووده هاتووە: ((عدلت شهادة الزور الإشراك بالله "عز وجل ")) رواه أحمد. واتە: شایەتی ناحەقیی و درۆیینە هاوکێشە لەگەڵ شەریك

الجزء السابع عشر — سورة الحج

حُنَفَاءَ لِلَّهِ غَيْرَ مُشْرِكِينَ بِهِۦ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ
ٱلسَّمَآءِ فَتَخْطَفُهُ ٱلطَّيْرُ أَوْ تَهْوِى بِهِ ٱلرِّيحُ فِى مَكَانٍ سَحِيقٍ
(٣١) ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمْ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقْوَى ٱلْقُلُوبِ
(٣٢) لَكُمْ فِيهَا مَنَٰفِعُ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ثُمَّ مَحِلُّهَآ إِلَى ٱلْبَيْتِ
ٱلْعَتِيقِ (٣٣) وَلِكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنسَكًا لِّيَذْكُرُوا۟ ٱسْمَ
ٱللَّهِ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلْأَنْعَٰمِ ۗ فَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ
فَلَهُۥٓ أَسْلِمُوا۟ ۗ وَبَشِّرِ ٱلْمُخْبِتِينَ (٣٤) ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ
قُلُوبُهُمْ وَٱلصَّٰبِرِينَ عَلَىٰ مَآ أَصَابَهُمْ وَٱلْمُقِيمِى ٱلصَّلَوٰةِ وَمِمَّا
رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ (٣٥) وَٱلْبُدْنَ جَعَلْنَٰهَا لَكُم مِّن شَعَٰٓئِرِ
ٱللَّهِ لَكُمْ فِيهَا خَيْرٌ ۖ فَٱذْكُرُوا۟ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَيْهَا صَوَآفَّ ۖ فَإِذَا وَجَبَتْ
جُنُوبُهَا فَكُلُوا۟ مِنْهَا وَأَطْعِمُوا۟ ٱلْقَانِعَ وَٱلْمُعْتَرَّ ۚ كَذَٰلِكَ سَخَّرْنَٰهَا
لَكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ (٣٦) لَن يَنَالَ ٱللَّهَ لُحُومُهَا وَلَا دِمَآؤُهَا
وَلَٰكِن يَنَالُهُ ٱلتَّقْوَىٰ مِنكُمْ ۚ كَذَٰلِكَ سَخَّرَهَا لَكُمْ لِتُكَبِّرُوا۟
ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمْ ۗ وَبَشِّرِ ٱلْمُحْسِنِينَ (٣٧) ۞ إِنَّ ٱللَّهَ
يُدَٰفِعُ عَنِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ خَوَّانٍ كَفُورٍ (٣٨)

٣٣٦ — أذن للذين

و هاوبەش داناندا بۆ خوای گەورە. ﴿[٣١] حنفاء لله غير مشركين به﴾ هەمیشە هەوڵ بدەن دڵپاك و ڕاستبن و، هەر بۆ خوا خۆ یەکلا بکەنەوە، وەلە هەموو جۆرە شیرکێك خۆ لابدەن و، هاوەڵی بۆ دامەنێن ﴿ومن يشرك بالله﴾ و هەرکەسێك هاوەڵ و هاوبەش بۆ خوا دابنێت ﴿فكأنما خر من السماء فتخطفه الطير﴾ وەکو ئەوەیە لە ئاسمانەوە بەربێتەوە "بۆ قوڵایی زەویی" کتوپڕ هەر لەهەواوە مەل و پەلەوەر لەسەری ئامادە بێت و بیفڕێنێ و پارچە پارچەی بکات ﴿او تهوى به الريح فى مكان سحيق﴾ یاخود بایەکی بەهێز و قورس بیبا بۆ جێگایەکی دوورو چەپەك و ملی بشکێنێ، ئەوە نموونەی کەسێکە هاوەڵ بۆ خوا دابنێ، چونکە لەئاسۆی بەرزی باوەڕەوە ئەکەوێتە چاڵی هەرە خواری تیا چوونەوەو، جێگەی قایمی خۆی لەدەست داوەو پەلەوەر سەری تێ ئەکەن ﴿[٣٢] ذلك ومن يعظم شعائر الله﴾ کاروباری حەج ئا بەو شێوەیە بۆتان ڕۆشن کرایەوەو دەبێ ئاوا ئەنجامی بدەن، جا هەرکەسێك بەو پێودانەی

ڕێزی قوربانیی و فەرمان و دروشمەکانی تری خوا ڕابگرێ، واتە: کاروباری حەج و قوربانیی و دیاریی (کابە) قەڵەو بکا بۆ ڕۆژی سەر بڕین ﴿فإنها من تقوى القلوب﴾ چونکە بە گەورە دانانی ئەو دروشمانە لە تەقواو خۆپاراستنی دڵەکانە، ئەوەی مەبەست بێ لەحەج و دروشمەکانی خوادا، تەنها تەقوایە. (ئەبو رافیع) ئەڵێ: پێغەمبەرﷺ دوو بەرانی گەورەی قەڵەوی شاخداری خەسێنراوی کردە قوربانیی. پێشەوا (ئەحمەد)" هەروەها (عەلی ئەبی تالیب) ئەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمانیدا تەماشای چاوو گوێی حەیوانی قوربانی بکەین (تا دەکرێ بێ عەیب و ناتەواو نەبن) پێشەوا ئەحمەد. بەکورتیی: هەر عەیبێك گۆشت کەم بکاو حەیوانەکە لەڕولاواز بکا، ئەوە بۆ قوربانی ناشێ. ﴿[٣٣] لکم فيها منافع إلى أجل مسمى﴾ دەتوانن تا کاتی دیاریی کراو بۆ سەر بڕینی حەیوانەکانی دیاری کابە جۆرەها کەڵك و سوودیان لێ وەرگرن وەك بەکارهێنانیان بۆ سواریی و شیرو دۆو کەرەو ماست و.. ﴿ثم محلها إلى البيت العتيق﴾ لەپاشان جێگەی بەقوربانیکردنیان لای ماڵی دێرینە بەڕێزەکەی خوایە، لە حەرەم، یان لەمینادا سەر ئەبردرێ، وەك خوی ئەفەرمووێ: (هديا بالغ الكعبة)٩٥/٥، یا وەك: ئەفەرموێ: (والهدى معكوفا أن يبلغ محله)٢٥/٤٨.

## لە هەموو ئایینێکدا قوربانی هەبووە:

﴿[٣٤] ولكل أمة جعلنا منسكا﴾ ئەم دیاریی و قوربانیە وە نەبێ تەنها بۆ ئێوە بێت، بەڵکو بۆ هەموو ئوممەتێك (لە ئوممەتانی پێشوو)دروشمی قوربانیی و خوێن ڕشتنمان دانابوو ﴿ليذكروا اسم الله على ما رزقهم من بهيمة الأنعام﴾ تا لە سەر سەربڕینی ئەو مەڕو ماڵاتە کە خوا پێیانی بەخشیبوو، نێوی خوا بێنن و سوپاسی بکەن ﴿فإلهكم إله واحد﴾ خۆ خواو پەرستراوی ئێوە پەرستراوێکی تاك و تەنهایە ﴿فله أسلموا﴾ جا کەواتە ئێوە هەمووتان تەنها ملکەچی بۆ ئەو بکەن و، تەسلیمی بڕیارەکانی ئەو بن ﴿وبشر المخبتين﴾ موژدەش بدە بەو بەندە خۆ بەکەمزان و ملکەچ کەرانە ﴿[٣٥] الذين إذا ذكر الله وجلت قلوبهم﴾ ئەوانەی کاتێ ناوی خوا برا، دڵیان – دائەچڵەکێ و پڕ ئەبێ لە ترس و هەیبەت ﴿والصابرين على ما أصابهم﴾ خۆڕاگرانیش لەبەرامبەر هەر نارەحەتیی و بەڵایەك دووچاریان ئەبێ ملکەچ دەبن و ڕەخنەیان نیە ﴿والمقيمي الصلاة﴾ ئەوانەش نوێژەکانیان بەباشی ئەنجام دەدەن ﴿ومما رزقناهم ينفقون﴾ لەو ماڵ و سامانەی پێمان بەخشیون دەبەخشن، ئابەم شێوەیە خوای گەورە گشت عەقیدەو دروشمەکانی خۆی پەیوەست ئەکات بەیەکەوە ﴿[٣٦] والبدن جعلناها لكم من شعائر الله﴾ سەربڕینی وشتری قەڵەوی زلە بۆ کردنی بە قوربانیمان کردە هێمای نیشانەی جێبەجێ کردنی دروشمەکانی خوا بۆتان، دەشێ لەکات و لەشوێنی خۆیدا ئەنجام بدرێت ﴿لكم فيها خير﴾ بێگومان کەڵکی زۆری دونیاو قیامەتیان تیایە بۆتان" لە دونیادا خێری زۆریان لێ ئەبینن و، لەقیامەتیشدا پاداشتیان پێ وەر ئەگرن ﴿فاذكروا اسم الله عليها صواف﴾ ئەو دەمەی وشترەکان بەپێوە وستاون و بۆ سەربڕین ئامادەن، ناوی خوایان لەسەر بێنن و، بڵێن: (بسم الله.. الله أكبر). مەبەست لە وشەی (صواف) ئەوەیە: وشتری قوربانی لەکاتی وەستاندا، هەردوو دەستی تائەژنۆی پێکەوە دەبەسترێن، هەتا لەکاتی سەربڕینیدا تەکانی زۆر نەدا و هەڵنەیەت ﴿فإذا وجبت جنوبها﴾ جاکاتێك –دوای سەربڕین – لەسەر تەنیشت کەوتن و گیانیان تیا نەماو لەجووڵە کەوتن ﴿فكلوا منها﴾ لێیان بخۆن ﴿وأطعموا القانع و المعتر﴾ ودەر خواردی ئەو مرۆڤە شەرمنە (داوا ناکا) ئەومرۆڤەیش پارسەکە (داوا دەکات) بدەن ﴿كذلك سخرناها لكم﴾ وەك ڕامکردنی شتەکانی دیکە وشتریشمان بەو گەورەیی و زلەییە بۆ ڕامکردوون، بەئاسانی سەری دەبڕن و، لەکاتی پێویستیشدا سواری دەبن ﴿لعلكم تشكرون﴾ بەشکو سوپاسگوزاریم بکەن.

**بە پاکی قوربانی بکەن:**

جا کە فەرمانیش بەسەربڕینی وشترەکان ئەدرێ، وە نەبێ لەبەر پێویستی خوا بێ پێیان، چونکە ﴿[٣٧] لن ينال الله لحومها ولا دماؤها﴾ نە گۆشتیان و، نەخوێنیان ناگاتە خوا! ﴿ولكن يناله التقوى منكم﴾ بەڵکو تەنها پاکی و پارێزگاریی ئێوەی پێدەگا، کە یەکلا بوونەوەتانە بۆ ئەو، نەك وەك قورەیشیەکان ئاژەڵیان سەر ئەبڕیی و خوێنەکەیان بە کابەدا هەڵئەسوی، بتەکانیشیان پێ ڕەنگ ئەکرد! ﴿كذلك سخرها لكم﴾ ئا بەوشێوە کە دەبینن خوا چوار پێیانی بۆ ئێوە کەوی و رامکرد ﴿لتكبروا الله على ما هداكم﴾ هەتاخوا – لە بەرامبەر ئەوەوەڕێگەی ڕاستی نیشان داون – بە گەورە ڕای بگرن ﴿وبشر المحسنين﴾ موژدەش بەخێر خوازان و چاکەکاران بدە ئەوانە بیریان چاکە، بۆ چوونیان چاکە، خوا پەرستییان چاکە، چاکیش ئەزانن کە چۆن پەیوەندی بە خواوە بکەن.

**خوا لەسەر باوەڕداران دەکاتەوە:**

﴿[٣٨] إن الله يدافع عن الذين آمنوا﴾ بەڕاستی خوا بەرگریی وبەرەوانی لەوانە دەکات ئیمان و باوەڕیان هێناوە. واتە: خراپە وخراپەکاری بێ بڕوایان ڕەت ئەکاتەوە لێیان، وەك خۆی دەفەرموێ: (أليس الله بكاف عبده)٣٦/٣٩. یا وەك ئەفەرموێ: (ومن يتوكل على الله فهو حسبه)٣/٦٥. ﴿إن الله لا يحب كل خوان كفور﴾ بەڕاستی خوا هەموو جۆرە کەسێکی گزیکاری بێ بڕواو سپڵەی خۆش ناوێ.

**فەرمان بە جیهاد و تۆڵە کردنەوە:**

﴿[٣٩] اذن للذين يقاتلون بأنهم ظلموا﴾ بڕیارو مۆڵەتی تۆڵەکردنەوە دراوە بەرامبەر بەو ئیماندارانەی شەڕیان بەسەردا سەپێنراوە و جەنگیان لەگەڵکراوە – لەلایەن بێ بڕواکانەوە – چونکە ناهەقی و ستەمیان لێکراوە. (ئیبن عەبباس) ئەڵێت: ئەم ئایەتەی (أذن..) یەکەم ئایەتێك بوو لەرێدان بەجیهاد، گەلێ جار یاران و هاوەڵان بەسەر شکاویی و دەست شکاوی ئەهاتنە لای پێغەمبەر ﷺ.. ئەویش ئەیفەرموو: خۆتان ڕابگرن، تا ئێستاش فەرمان بەجیهاد نەهاتووە، ئەوسا لەناچارییدا کۆچیان کرد ,پاشان ئەم ئایەتە هاتە خوارەوەو مۆڵەتی جەنگیان پێدراو دڵنیاشی کردن کە هەمیشە لەژێر حیمایەت و پارێزگاری خوادا دەبن ﴿وإن الله على نصرهم لقدير﴾ بەڕاستی خواش بۆ کۆمەك و یارمەتیدانیان زۆر بەتواناو بەهێزە، چونکە ئەو بڕوادارانە سەرەڕای ئەوەی ستەمی عەقیدەیان لێکراوە، لەوڵات و ناوچەو خاك و نیشتمانیشیان دەرکراون، بۆیە ئەفەرموێ: ﴿[٤٠] الذين اخرجوا من ديارهم بغير حق﴾ ئەوانەی هەر بەناهەقی لەزێدو ماڵ و شاری خۆیان دەر کران!! ﴿إلا ان يقولوا ربنا الله﴾ هیچ گوناهێکیان نەبوو، مەگەر هەر ئەمە کە ئەیان وت: پەروەردگاری ئێمە(الله) خوایەکی تاك و تەنیایە!دیارە ئەمان وەك ئەوان هیچ کەسێکیان نەئەکردە هاوبەش و هاوەڵیخوا، بێگومانەهەموو کاتێ ملهوڕان لەو یەکلابوونەوەیە ترساون وئەیشترسن

الجزء السابع عشر — سورة الحج

أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا۟ ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَٰرِهِم بِغَيْرِ حَقٍّ إِلَّآ أَن يَقُولُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ ۗ وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّهُدِّمَتْ صَوَٰمِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَٰتٌ وَمَسَٰجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا ٱسْمُ ٱللَّهِ كَثِيرًا ۗ وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴿٤٠﴾ ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّٰهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ أَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُوا۟ بِٱلْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا۟ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۗ وَلِلَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ ﴿٤١﴾ وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدْ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَعَادٌ وَثَمُودُ ﴿٤٢﴾ وَقَوْمُ إِبْرَٰهِيمَ وَقَوْمُ لُوطٍ ﴿٤٣﴾ وَأَصْحَٰبُ مَدْيَنَ ۖ وَكُذِّبَ مُوسَىٰ فَأَمْلَيْتُ لِلْكَٰفِرِينَ ثُمَّ أَخَذْتُهُمْ ۖ فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ ﴿٤٤﴾ فَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَٰهَا وَهِىَ ظَالِمَةٌ فَهِىَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا وَبِئْرٍ مُّعَطَّلَةٍ وَقَصْرٍ مَّشِيدٍ ﴿٤٥﴾ أَفَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَآ أَوْ ءَاذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا ۖ فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى ٱلْأَبْصَٰرُ وَلَٰكِن تَعْمَى ٱلْقُلُوبُ ٱلَّتِى فِى ٱلصُّدُورِ ﴿٤٦﴾

٣٣٧

﴿ولولا دفع الله الناس بعضهم ببعض﴾ سوننەتی خوا وایە کە: ئەگەر خوا خۆی هەندێ خەڵکی بە هەندێکی دی پاڵ پێوە نەناباو فەرمانی جیهادی نەدابا ﴿لهدمت صوامع وبيع وصلوات﴾ هەرچی دێرو پەرستگای گۆشەگیران (رهبان) و کەنشتەی جوولەکان ﴿ومساجد يذكر فيها اسم الله كثيرا﴾ و مزگەوتی موسڵمانان -کە ناوی خوایان زۆر تیا دەبرێ- وێران دەکران، واتە: بێ بڕوایان زاڵدەبوون بەسەر تەواوی ئایینە ئاسمانییەکانداو گشت پەرستگاکانیشیان وێران دەکرد ﴿ولينصرن الله من ينصره﴾ بێگومانە خوا یارمەتی ئەو کەسە دەدات، کە یارمەتی ئایینەکەی ئەو بداو، مەڵبەندەکانی خواپەرستیی بپارێزێو، لە پێناویاندا جیهاد بکات، خۆ حیکمەتی خوایگەورەش وایە هەرگیزیارمەتی تەمەڵ و خۆ لاوازکەرو سستەکان نادات، بەڵکو تەنها یارمەتی ئەهلی گۆڕەپان و کۆشەران ئەدات ﴿إن الله لقوى عزيز﴾ بەڕاستیی خوا زۆر بەهێزو دەستەڵاتە، هیچ کەسێك دەرەقەتی نایە. بەڵێ.. ئیسلام تەنها بەنوێژ و قورئان خوێندن و.. هتد سەرناکەوێ، بەڵکو "سەرەڕای ئەوانەش" هەوڵ و کۆشان و جیهادو هیجرەت و لێ بڕانیشی دەوێ.

## ئەو دەمە موسڵمان حوکمی دەکەوێتە دەست:

﴿[41] الذين إن مكناهم فى الأرض اقاموا الصلاة وآتوا الزكاة﴾ ئەوانەی وا شایستەیئەوەن کە خوا یارمەتییان بدات و بەرگرییان لێ بکات، کەسانێکن کە ئەگەر خوا لەم زەوییەدا پایەدارو بەهێزیان بکاو دەسەڵاتیان پێ بدا، نوێژ بە ڕێك و ڕێکی ئەکەن و، ملکەچی فەرمانی خوا ئەبن و، بەشێکی سامانیشیان لە زەکاتا ئەدەن, واتە: مافی دارایی خۆیان جێبەجێ ئەکەن ﴿وامروا بالمعروف﴾ و فەرمان بەچاکە ئەدەن و، مەردوم بەرەو خێرو صەلاحەت ئەبەن ﴿ونهوا عن المنكر﴾ و بەر لەکاری خراپە دەگرن و رووبەڕووی فەسادو هێزی شەڕ ئەوەستن ﴿ولله عاقبة الأمور﴾ کۆتایی و سەرەنجامی هەموو کارەکانیش هەر بۆ خوایە.

## دوارۆژی بەدرۆ خەرەوان:

بەڵێ.. سەرخستن و یارمەتیدانی موسڵمانان گەلێ مەرجی تایبەتی خۆی هەیە، زەحمەت و ماندوو بوونێکی زۆری دەوێ پێویستە ئەو مەرجانە گشت بێنە جێ، ئەوجا یارمەتیش دەبێ. خوای گەورە بەم ئایەتە دڵخۆشی پەیامبەرﷺ ئەداتەوەو ئەفەرموێ: ﴿[42] وإن يكذبوك فقد كذبت قبلهم قوم نوح وعاد وثمود﴾ خۆ ئەگەر ئەوانە تۆ بەدرۆزن دەزانن و بڕوات پێناکەن، دڵ زویر مەبە، چونکە لە پێش ئەمانەیشەوە گەلی نوح وعاد وثمود پەیامبەرانی خۆیانیان بەدرۆزن زانیوەو بڕوایان پێ نەهێناون و چوون بەگژیاندا، وەك گەلی نوح و عادو سەموود، چوون بەگژ پەیامبەرەکانیاندا و بەدرۆزنیان دانان و بڕوایان پێ نەهێنان ﴿[43] وقوم إبراهيم وقوم لوط *[44] وأصحاب مدين﴾ وە گەلەکەی ئیبراهیم و لوت و هۆزی شوعەیب (نیشتەجێکانی مەدیەن)یش ﴿وكذب موسى﴾ وموسایش لەلایەن فیرعەون و دارو دەستەکەیەوە بەدرۆزن دانرا ﴿فأمليت للكافرين ثم اخذتهم﴾ ئینجا منیش بۆماوەیەك مۆڵەتم بەوبێ بڕوایانە دا، هەروەك دەبینی مۆڵەت بەقورەیش درا، پاشانیش قارو غەزەبم لێ گرتن ﴿فكيف كان نكير﴾ جا ئینکاریی و بێزاریی من لەوانە چۆنبوو؟ وەك ئەفەرموێ: (ثم اخذتهم فكيف كان نكير)؟ خەڵکێکی زۆر لە سەلەف دەڵێن: ماوەی نێوان وتەکەی فیرعەون (أنا ربكم الأعلى) و تیا چوونەکەی چل ساڵی خایاند! بۆیە (بوخاریی و موسلیم) ئەم فەرموودەیان هێناوە: ((إن الله ليملى للظالم حتى إذا أخذه لم يفلته)) واتە: لەسەرەتاوە خوا مۆڵەت بە مرۆی ناهەقکارو ستەمکار دەدا - واتە: جڵەوی بۆ شل دەکا- تا کاتێ کتوپڕ کە گرتی، ئیتر هەرگیز بەری ناداو ڕزگاری نابێ. پاشان پێغەمبەر ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (وكذلك أخذ ربك إذا أخذ القرى وهى ظالمة إن أخذه اليم

شدید). بەڵێ.. بەهەقیقەت گرتنەکەی زۆر سەخت و قورس وبێ وێنە بوو، تۆفان، نقوم کردن و خنکاندن، وێران کردن و بوومە لەرزەو باو بۆران ﴿[45] فکأین من قریة اهلکناها﴾ ئینجا فەوتاندنی گەلانی بێ باوەڕی پێشووی بۆ باس ئەکات، و ئەفەرموێ: ئای چ خەڵکێکی زۆری شارو گوندەکانمان لەناو برد (پاش ماوە پێدانیان) ﴿وهی ظالمة﴾ چونکە ناهەق و ستەمکارو بێ بڕوا بوون ﴿فهی خاویة علی عروشها﴾ دیواری خانوو بەرەیان بەسەر سەقف و میچ و لای سەرویدا کەوت، واتە: ڕووداوەکە ئەوەندە توندو قورس بوو" لە پێشەوە بەشی سەرەوەی کەوت، ئینجا دیوارەکانی، یا بڵێین: کورد واتەنی داریان بەسەر بەردا درا ﴿وبئر معطلة﴾ و دەوری زۆر چاڵاوو بیری پڕ ئاویان بێ خاوەن کەوت و چۆڵ کراو کەسێك نەبوو سوودی لێ وەرگرێ ﴿وقصر مشید﴾ وە زۆر کۆشکی بتەوو بەرزو سەر بەئاسمان کشاوو ڕازاوەیان وێرانکران و، خاوەنەکانیان تیا چوون، دەئایا ئەو کارانە پەندو ئامۆژگاری ناگەیەنن!! وەك ئەفەرموێ: (أینما تکونوا یدرککم الموت ولو کنتم فی بروج مشیدة)٧٨/٤. ﴿[46] أفلم یسیروا فی الأرض﴾ ئاخۆ هێشتا ئەوانە بەزەوییدا نەگەڕاون؟ ﴿فتکون لهم قلوب یعقلون بها﴾ تا ببنە خاوەن دڵان و ڕاستییەکانی پێ دەرك بکەن؟ ﴿او آذان یسمعون بها﴾ وە یاگوێچکە گەلێکی ژنەوا کە بانگی ڕاستیی پێ ببیستن؟ واتە: ئەوانە هەر وەك دڵ و گوێیان نەبێ وایە، بۆیە بەژیرانە نابینن و نابیسن و بیر ناکەنەوە؟ ﴿فإنها لا تعمی الأبصار﴾ لەڕاستیدا چاو کوێر نابن ﴿ولکن تعمی القلوب التی فی الصدور﴾ بەڵکو ئەو دڵانە کوێر دەبن و هێزی دەرك کردنیان نامێنێ و بینایی خۆیان لەدەست ئەدەن.. کە جێیان لەناو سینەکانە، بۆیە چاوەکانیش بەدوای ئەواندا ئەڕۆن و زەینیان نامێنێ.

**خوانەناسان پەلەی سزایانە:**

﴿[47] ویستعجلونك بالعذاب ولن یخلف الله وعده﴾ و لەباتی ئەوەکە وردببنەوە لەشوێنەواری تیاچووەکان! کەچی بەگاڵتەوە بەپەلە داوای سزات لێ ئەکەن! خۆ هەرپێش دێت، بەڵام هەموو شتێك بەلای خواوە کاتێکی بۆ بڕاوەتەوە، خواش هەرگیز لەبەڵێنی خۆی پێچەوانە کار ناکات ﴿وان یوما عند ربك کألف سنة مما تعدون﴾ خوا زۆر لەسەر خۆ کار ئەکا.. چونکە تاکە ڕۆژێ لەلای پەروەردگارت، بە قەد هەزار ساڵە کە ئێوە ئەیژمێرن، ﴿[48] وکأین من قریة املیت لها وهی ظالمة﴾ شارو گوندێکی زۆر –کە ستەمکار بوون– مۆڵەتم دان ﴿ثم اخذتها وإلی المصیر﴾ لەپاشان غەزەبم لێ گرتن و لەناوم بردن و، هەمووشیان تەنها بۆلای من ئەگەڕێنەوە، ئەم ئایەتەیش ئەوپەڕی نەفامییان دەر دەخا کاتێ کە پەلە ئەکەن بۆ سزا وەك ئەفەرمووێ: (وإذ قالوا اللهم إن کان هذا هو الحق من عندك فأمطر علینا حجارة من السماء أو ائتنا بعذاب الیم)٣٢/٨. یاخود (قالوا ربنا عجل لنا قطنا قبل یوم الحساب)١٦/٣٨. ئیمامی (ترمزیی و نەسائی) ئەم فەرموودەیان هێناوە (بۆ پشتگیری کردنی ئەوە کە تەنها ڕۆژێکی‌قیامەت لەلای خوا بەقەد هەزار ساڵی

الجزء السابع عشر — سورة الحج

وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِٱلْعَذَابِ وَلَن يُخْلِفَ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥ وَإِنَّ يَوْمًا
عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴿٤٧﴾ وَكَأَيِّن مِّن
قَرْيَةٍ أَمْلَيْتُ لَهَا وَهِيَ ظَالِمَةٌ ثُمَّ أَخَذْتُهَا وَإِلَيَّ ٱلْمَصِيرُ
﴿٤٨﴾ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّمَآ أَنَا۠ لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٤٩﴾ فَٱلَّذِينَ
ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٥٠﴾
وَٱلَّذِينَ سَعَوْا۟ فِىٓ ءَايَٰتِنَا مُعَٰجِزِينَ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَحِيمِ
﴿٥١﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ وَلَا نَبِىٍّ إِلَّآ إِذَا تَمَنَّىٰٓ
أَلْقَى ٱلشَّيْطَٰنُ فِىٓ أُمْنِيَّتِهِۦ فَيَنسَخُ ٱللَّهُ مَا يُلْقِى ٱلشَّيْطَٰنُ
ثُمَّ يُحْكِمُ ٱللَّهُ ءَايَٰتِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٥٢﴾ لِّيَجْعَلَ
مَا يُلْقِى ٱلشَّيْطَٰنُ فِتْنَةً لِّلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَٱلْقَاسِيَةِ
قُلُوبُهُمْ ۗ وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَفِى شِقَاقٍۭ بَعِيدٍ ﴿٥٣﴾ وَلِيَعْلَمَ
ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَيُؤْمِنُوا۟ بِهِۦ
فَتُخْبِتَ لَهُۥ قُلُوبُهُمْ ۗ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهَادِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِلَىٰ صِرَٰطٍ
مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٤﴾ وَلَا يَزَالُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى مِرْيَةٍ مِّنْهُ حَتَّىٰ
تَأْتِيَهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغْتَةً أَوْ يَأْتِيَهُمْ عَذَابُ يَوْمٍ عَقِيمٍ ﴿٥٥﴾

ئێمەیە: ((یدخل فقراء المسلمین الجنة قبل الأغنیاء - بنصف یوم - خمسمأة عام))، واتە: موسڵمانە هەژارەکان بەنیو ڕۆژ پێش دەوڵەمەندەکان دەچنە بەهەشت، پرسیار لە ئەندازەی ئەو نیو ڕۆژەیە کرا، فەرمووی: پێنج سەد ساڵە.

**جەزاو تۆڵەی چاکان و خراپان:**

ئینجا داوا لە پەیامبەر ﷺ ئەکات کە بەپاشە ڕۆژێکی ناقۆڵاو ڕەش بیانترسێنێ: ﴿[٤٩] قل یا ایها الناس إنما انا لکم نذیر مبین﴾ بڵێ: ئەیخەڵکینە! بەڕاستیی من بۆ ئێوە تەنیا هەر ترسێنەرێکی ئاشکرام، ئیتر لەوە بەولاوە دەسەڵاتێکم نییە بۆ پێشخستنی سزا، وەیا بۆ دواخستنی، ئینجا پاشەڕۆژی بڕواداران دیاریی ئەکات: ﴿[٥٠] فالذین آمنوا وعملوا الصالحات لهم مغفرة ورزق کریم﴾ جا ئەوانەی وا بڕوایان هێناوەو کارەچاکەکانیان ئەنجام داوە لێبوردن و ڕۆزیەکی پاك و پیرۆزیان لەبەهەشتدا بۆ دەبێ ﴿[٥١] والذین سعوا فی آیاتنا معاجزین﴾ و ئەوانەش بۆ لەکار خستن و پووچەڵ کردنەوەی ئایەتەکانی ئێمە کۆشان و ویستیان پەکیان بخەن و زاڵ بن ﴿اولئك اصحاب الجحیم﴾ ئەوانە هاوڕێی دۆزەخن و لێی دوورناکەونەوە.

**شەیتان مێملی هەموو پێغەمبەرێك بووە:**

دیارە هەرچۆنێ خوای گەورە بانگەوازەکەی لەبێ بڕوایان ئەپارێزێ، هەروایش لەفێڵی شەیتان ئەیپارێزێ و ناهێڵێ دەغەڵی ئەوی تێکەڵ ببێ، وەك ئەفەرموێ: ﴿[٥٢] وما ارسلنا من قبلك من رسول ولا نبی﴾ لەپێش تۆشدا ئێمە هەرپێغەمبەرێکی خاوەننامەو بێ نامەمان ناردبێت، کە نیشانەکانمان بەخەڵك ڕاگەیێنێت ﴿إلا إذا تمنی القی الشیطان فی امنیته﴾ ئیللا شەیتان گۆڕانکاریی و دەغدەغەی خۆی لەپاڵ ئاخنیوە. (فتح القدیر) ئەڵێ: (قال البغوی: إن أکثر المفسرین قالوا معنی (تمنی) تلا وقرأ کتاب الله، ومعنی (ألقی الشیطان فی أمنیته) أي في تلاوته وقراءته. قال ابن جریر: هذا القول أشبه بتأویل الکلام. قال القاضي عیاض: واعلم أن الأمة مجتمعة علی عصمة النبی ﷺ من الشیطان في جسمه وخاطره و لسانه..) کەوابوو پێغەمبەر هیچ کات هەڵەو ناهەقی بەزمانیدا نەهاتووە، ئەگەرچی موشریکانیش شتێکیان لێ کردبێ بەهەرا، ئەوە هەر بەئاماژەی شەیتان بووە، وە ئەوەش تەنها بۆ پێغەمبەر ﷺ نەبووە، بەڵکو پێغەمبەرانی پێش ئەویش تووشی ئەو دیعایەو چاوڕوایە بوون، بەڵێ: گەلێ ڕیوایەت هاتووە دەم لەهۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتانە ئەدەن، بەڵام (ئیبن کەسیر) ئەڵێ: ئەو ڕیوایەتانە گشتیان (مورسەل)ن و، لەڕێگەیەکی ڕەوانەوە پشتگیرێکم دەست نەکەوتووە بۆیان. بەڵێ.. پەیامبەران زۆریان پێ خۆش بووە مەردوم لێیان کۆ ببنەوەو بڕوایان پێ بێنن، بۆیە گەلێ جار لەو پێناوەدا ئاواتیان ئەخواست کەخەڵکەکە بانگەوازەکەیان لێوەرگرن، وە لەوڕێگەیەشدا جاری وا ئەبوو لەبەرخاتری بانگەوازەکەیان- نەرم و نیانیشیان ئەکرد، جا شەیتانیش ئەوەی بە هەڵدەزانی و لێی ئەکردنە هەراو، ئیتر فرت و فێڵی خۆی ئەهاویشتە دڵی موشریکانەوە، وەك داستانەکەی (ئیبن ئوم مەکتوم) و (زەینەبی کچی جەحش) و..هتد، بەڵام خوا مەسەلەکەی لە بێژنگ داو هەق و ناهەقی لێك کردەوە. "سەید"یش پاش هێنانی هەموو ڕیوایەتەکان دەڵێت: ئەوانەی لەم جێگایەدا داستانی (غەرانیق) دەگێڕنەوەو هەندێ پاڵپشتیشی بۆ دێنن، هەموو لەبنەڕەتدا لاوازن، وە لە ڕووی (سەنەد)ـەوە پشتیان پێ نابەسترێ. وە زانایانی ئەهلی حەدیس دەڵێن: هەرکەسێ قسەی لێ وەرگیرابێ ئەو ڕیوایەتەی نەهێناوە، چونکە سەنەدێکی متمانە پێکراوی نەبووە. "ئەبوبەکری بەززار" ئەڵێت: قەناعەتم نییە کە لەپەیامبەرەوە ﷺ بەسەنەدێکی پەیوەستەوە ئەو قسەیە گێردرابێتەوە، لەولایشەوە لەگەڵ بناغەیەکی بەرزی بیرو

باوەڕدا کە بریتی یە لەوە پەیامبەر ﷺ دەبیٚ شەیتان نەتوانیٚ پەیامەکەی لیٚ تیٚك بدات و خەڵتەو پەڵتەی تیٚکەڵ بکات بەیەکا هەڵ ئەتەقیٚن، ئیتر چۆن دەبیٚت ﴿أفرأيتم اللات والعزى ومناة الثالثة الأخرى ألكم الذكر وله الأنثى؟﴾ بخویٚنیٚ و شەیتان بەزمانی ئەوەوە ئەم وشانە: (وإنهن لهن الغرانيق العلى، وإن شفاعتهن لهى التى ترتجى..) بڵاو بکاتەوەو بیگەیەنیٚت بە هەموو موشریکان و ئەوانیش بڕوا بکەن.. کاتیٚ پەیامبەر ﷺ لیٚ ببیٚتەوە لە سوورەتی (نەجم) سوژدە ببات و ئەوانیش وا بزانن کە بۆ بتەکان سوژدەی بردووە؟! ﴿فينسخ الله ما يلقى الشيطان﴾ ئەوسا خوا فەندو فیٚڵەکەی شەیتانی پووچ کردەوەو سڕییەوە ﴿ثم يحكم الله آياته﴾ لەپاشان ئایەتەکانی خۆی جیٚگیرو پتەو پایەدار کردۆتەوە و بەچاکیی هیٚشتوویەتەوە ﴿والله عليم حكيم﴾ و خوا زانست و زانیاریی زۆرە، کار جوان و لەکارزانە، گشت کاریٚکی پڕ لە حیکمەتە ﴿[٥٣] ليجعل ما يلقى الشيطان فتنة للذين فى قلوبهم مرض﴾ هەتا وا بکا ئەوەی شەیتان هاویشتوویەتیە ناو خوێندنەکەی پیٚغەمبەرەوە، ببیٚتە فیتنەو میٚمل بۆ ئەوانەی دڵیان دەغزدارو نەخۆشە ﴿والقاسية قلوبهم﴾ وە بۆ ئەوانەش کە هەردەم دڵڕەق و دڵڕەشن، دەبیٚ خەڵك لەبیٚژنگ بدریٚ، تا دەرکەویٚ کیٚ بەدوای چاوو ڕادا ئەگەڕیٚ و، کیٚش ڕاستیی و هەقیقەتی ئەویٚ و، بڕوای دامەزراوەو، بەفرت و فیٚڵی شەیتانەکان دوو دڵی ڕووی تیٚ ناکات ﴿وإن الظالمين لفى شقاق بعيد﴾ و بیٚگومان ستەمکاران سەبارەت بەئایینی خوا بەردەوام لەدژایەتیەکی زۆر قوڵ و دوور لەڕاستییدان" بۆیە ئاوا چاوو ڕای تیٚکەڵ ئەکەن ﴿[٥٤] وليعلم الذين أوتوا العلم أنه الحق من ربك﴾ دەبا ئەوکەسانەش وازانیاریەکی کەڵك بەخشیان پیٚدراوە چاك بزانن کە بەڕاستیی تەنهائەو قورئانەیە ڕاست و دروست و لەلایەن پەروەردگارتەوەیەو، هەق و ناهەق لیٚك جیا ئەکاتەوە ﴿فيؤمنوا به﴾ ئینجا باوەڕی پیٚ بهیٚنن ﴿فتخبت له قلوبهم﴾ دڵەکانیشیان تەسلیمی ئەو ببیٚ و، بەملاو بەولادا جموجوڵی نەمیٚنیٚ ﴿وإن الله لهاد الذين آمنوا﴾ و بیٚگومان خوا شارەزایی و ڕیٚنویٚنی ئەوکەسانە دەکا بڕوایان هیٚناوە ﴿إلى صراط مستقيم﴾ بۆ ڕیٚگەو ڕیٚبازی ڕاست، وە لەگومرایی و سەر لیٚشیٚواوی ڕزگاریان ئەکات.

**خوانەناس هەتا قیامەت لە قورئان دوودڵە:**

﴿[٥٥] ولا يزال الذين كفروا فى مرية منه﴾ ئەوانەیش خوا نەناس و بیٚ باوەڕن هیٚشتا هەر دوودڵ و بەدگومانن سەبارەت بەقورئان ﴿حتى تأتيهم الساعة بغتة﴾ تا ڕۆژیٚ کتوپڕ قیامەتیان دەگاتیٚ ﴿أو يأتيهم عذاب يوم عقيم﴾ یاخود تا سزای ڕۆژیٚکی بیٚ پیت و نەزۆکیان وەك (ڕۆژی بەدر)، یا وەك ڕۆژی (قیامەت) دەگاتیٚ،ئەوان تا ئەو ڕۆژەیە هەر ژەهری خۆیان ئەڕیٚژن و، بەم لاو بەولادا هەوڵ ئەدەن! ﴿[٥٦] الملك يومئذ لله﴾ جا ئیتر لەو ڕۆژەدا دەسەڵات و فەرمانڕەوایی تەنها بۆ خوایەو هیچ کەسیٚك ناتوانیٚ هیچ شتیٚك بکات، وەك خۆیشی ئەفەرمووێ: (مالك

الجزء السابع عشر — سورة الحج

ٱلْمُلْكُ يَوْمَئِذٍ لِّلَّهِ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ ۚ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟
وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فِى جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٥٦﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟
وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا فَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿٥٧﴾
وَٱلَّذِينَ هَاجَرُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ قُتِلُوٓا۟ أَوْ مَاتُوا۟
لَيَرْزُقَنَّهُمُ ٱللَّهُ رِزْقًا حَسَنًا ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ خَيْرُ
ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿٥٨﴾ لَيُدْخِلَنَّهُم مُّدْخَلًا يَرْضَوْنَهُۥ ۗ وَإِنَّ
ٱللَّهَ لَعَلِيمٌ حَلِيمٌ ﴿٥٩﴾ ۞ ذَٰلِكَ وَمَنْ عَاقَبَ بِمِثْلِ
مَا عُوقِبَ بِهِۦ ثُمَّ بُغِىَ عَلَيْهِ لَيَنصُرَنَّهُ ٱللَّهُ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ
لَعَفُوٌّ غَفُورٌ ﴿٦٠﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِى
ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِى ٱلَّيْلِ وَأَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ
﴿٦١﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن
دُونِهِۦ هُوَ ٱلْبَٰطِلُ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْكَبِيرُ ﴿٦٢﴾
أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَتُصْبِحُ ٱلْأَرْضُ
مُخْضَرَّةً ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ ﴿٦٣﴾ لَّهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿٦٤﴾

٣٣٩

یوم لدین)١/٤.یا دەفەرمووێ: (الملك یومئذ الحق للرحمن وكان یوما علی الكافرین عسیرا). ﴿یحكم بینهم﴾ لەنێوانیاندا داوەریی دەكا ﴿فالذین آمنوا وعملوا الصالحات فی جنات النعیم﴾ ئەوسا ئەو كەسانەی بڕوایان هێناوەو لەگەڵ بڕواكەیاندا كارە چاكەكانیان ئەنجام داوە لەناو بەهەشتە خۆش و پڕ لە نازونیعمەت و نەبڕاوەكاندا نشتەجێ ئەبن ﴿٥٧ والذین كفروا وكذبوا بآیاتنا﴾ ئەوكەسانەش بێ بڕوا بوون و ئایەتەكانی ئێمەیان بە درۆ دەدایە قەڵەم ﴿فأولئك لهم عذاب مهین﴾ سزایەكی ڕیسواكەرو ئابڕوو بەریان -لەدۆزەخدا- بۆ هەیە. كۆچ (هجرەت) لەپێش ئازاد كردنی شاری مەككەو دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامییدا هەر دەبوو بكرایە بۆ مەدینە، بەڵام دوای ئەوئازاد كردنەیە ئیتر كارو تێكۆشان و جیهادە. ئینجا باسی ئەو هیجرەت و كۆچ كەرانە ئەكات، دوای ئەوەی لە پێناوی پاراستنی عەقیدەكەیاندا مۆڵەتی جەنگ دران، بۆیە ئەفەرمووێ: ﴿٥٨ والذین هاجروا فی سبیل الله﴾ ئەوكەسانەش لەبەر خوا لە مەككەوە بۆ مەدینە كۆچیان كردوو وڵات و نیشتمانیان بەجێ هێشت و ئاوارە بوون ﴿ثم قتلوا أو ماتوا﴾ پاشان كوژراون و شەهید كراون، وەیان بەهەر هۆیەكی تربووە مردون، ئەگەرچی لەسەر رایەخ و جێی خۆیشیدا مردبێت، ئەوە هەر ئەو پاداش و مزەیەیان بۆ هەیە، وەك خوای گەورە ئەفەرمووێ: (ومن یخرج من بیته مهاجرا إلی الله ورسوله ثم یدركه الموت فقد وقع أجره علی الله)١٠٠/٤. (شەرەحبیل) دەڵێ: لەكاتی گرتنی قەڵایەكی ڕۆمەكانا زۆر دواكەوتین و ماتڵ بووین! جا (سەلمان) دای بەلاماناو وتی: لەپێغەمبەرم ﷺ بیستووە فەرموویەتی: ((من مات مرابطا أجری الله علیه مثل ذلك الأجر، وأجری علیه الرزق وأمن من الفتانین)) واتە: هەركەسێكیش هەر لەكاتی خۆ ئامادەكردندا بۆ جیهاد بمرێ دیسان خوای باڵادەست هەر ئەوكرێ و پاداشتەی پێدەبەخشێ و، ڕزق و ڕۆزیشی پێدەداو، لەهەردوو سزادەرەكەش هێور دەكرێتەوە. ئەگەر حەزیش ئەكەن ئایەتی: (والذین هاجروا ثم قتلوا أو ماتوا...) بخوێننەوە. ئیمامی موسلیم. ﴿لیرزقنهم الله رزقا حسنا﴾ بێگومان خوا ڕۆزی و نیعمەتێكی فرە چاكی نەبڕاوەیان پێ ئەبەخشێ ﴿وإن الله لهو خیر الرازقین﴾ وە بەڕاستیی هەر خوایە چاكترین ڕزق و ڕۆزی دەدات ﴿٥٩ لیدخلنهم مدخلا یرضونه﴾ و خوای گەورە هەر خۆی دەیانخاتە ئەوجێگایە كەپێی ڕازیی و خۆشنوودن ﴿وإن الله لعلیم حلیم﴾ و بەڕاستیی خوا زۆر زانایە، زۆر خۆگرو لەسەر خۆیە ئەزانێ پاداشتی كێ بداتەوەو، تۆڵەیش لەكێ وەربگرێ ﴿٦٠ ذلك ومن عاقب بمثل ما عوقب به﴾ بڕیار ئاوایە.. ئنیجا هەركەسێك تۆڵەی لێ سەنرایەوە بەپێی ئەوستەمە كردوویەتی كە ئەمەیش لە ئیسلامدا مافێكی ڕەوایە ﴿ثم بغی علیه لینصرنه الله﴾ دیسان بۆجارێكی تر دەستدرێژیی و ناهەقیی لێكرا هەر لەلایەن ئەو كەسەی پێشەوە، بەڕاستیی ئەوكەسە خوا كۆمەكی و یارمەتی ئەدا، تۆڵە لەدەست درێژیكار وەرگرێ ﴿إن الله لعفو غفور﴾ بێگومان خوا زۆر چاوپۆشی كارو، زۆریش لێبوردەیە.

**هەرخوایە دەسەڵاتداری بێ وێنە :**

﴿٦١ ذلك بأن الله یولج اللیل فی النهار ویولج النهار فی اللیل﴾ ئەوەش چونكە خوای گەورە زاتێكی ئاوایە شەو بەناو ڕۆژدا دەباو، ڕۆژیش دەخاتە ناو شەو. ئەمە لەچوار وەرزەكاندا زۆر بەڕوونی ئەبینرێ بەڵام لەبەر زۆر هۆگری لەگەڵیاندا بە شتێكی زۆر سادەو ئاسان سەیر ئەكرێن، جاباشە زاتێك كاری ئاوا بكا، بێگومانیشە دەشتوانێ یارمەتی بەندەی خۆی بدا ﴿وإن الله سمیع بصیر﴾ چونكە خوا ژنەواو بینایە ﴿ذلك بأن الله هو الحق﴾ ئەو دەسەبەر بوونەی خوا بۆ یارمەتیدانی ستەم لێكراوان لەبەرئەوەیە چونكە تەنها هەر خۆی ڕاست و هەقە، هەر ئایین و پەرستنی ئەو هەقە ﴿وإن ما یدعون من دونه هو الباطل﴾ و هەرشتێ كە بێ بڕوایان لەباتی ئەو هاواری بۆ ئەبەن و

ئەپپەرستن بتەکان و هەرشتێکیتر ئەوە باتڵە و پووچەڵە و لە ناهەق بەدەر نیە ﴿وان الله هو العلى الكبير﴾ و هەر ئەو خوایەیە بالادەستی گەورە، نە لەو بڵندتر هەیەو نە لەویش گەورەتر.

**ئەمانەش بەڵگەو نیشانەی خوان:**

﴿٦٣ الم تر ان الله انزل من السماء ماء﴾ هەرلەسەر بەڵگە هێنانەوە دەڕوات بۆ دەسەڵاتی خۆی، بۆیە ئەفەرمووێ: ئەی نەتدیوە خوا بارانی لەئاسمانەوە باراند ﴿فتصبح الأرض مخضرة﴾ زەویی دوای وشك بوون پێ کەسك و سەوزو جوان هەڵگێڕاو، ئەوسا زیندوو ئەبێتەوە و هەمووجۆرە دانەوێڵەو گیایەك ئەڕوێنێ ﴿إن الله لطيف خبير﴾ بەڕاستیی خوا زۆر بەلوتفە بۆ بەندەکانی خۆی زۆریش بەئاگایە بەوەی لەدڵیاندایە ﴿٦٤ له ما فى السموات وما فى الأرض﴾ هەرچی لەئاسمانەکان و لەزەویدایە موڵکی ئەوەو تەنها هەرئەویش ئەتوانێ دەست کاریان بکات ﴿وان الله لهو الغنى الحميد﴾ و بێگومان ئەوخوا بۆخۆی دەوڵەمەندو بێ نیازە لەهەموو بەندەکانی، هەر بۆ خۆیشی شیاوی سوپاس و ستایشە لەسەر نیعمەتەکانی ﴿٦٥ الم تر أن الله سخر لكم ما فى الأرض﴾ دیسانەوە هەر لەسەر بەڵگە هێنانەوە ئەڕوات و ئەفەرمووێ: ئەی نەتزانیوە کە بەڕاستیی هەرچی لە زەویدایە کانگاو گڵ و هەواو توخمەکان و ئاوێتە کراوەکان، زیندەوەران، بێ گیانەکان، گژو گیا خوا بۆ ئێوەی دەستەمۆو ڕام کردووە؟ ﴿والفلك تجرى فى البحر بأمره﴾ نە هەر ئەوەندە بەڵکو یاسای دەریاکانی وا دامەزراندووە کە: گەمیی و، کەشتیەکان هەر بەفەرمانی ئەو ،بەوهەموو بارو بارخانەوە بەنێویاندا دەڕۆن ﴿ويمسك السماء ان تقع على الأرض إلا بإذنه﴾ ئەم ئاسمانەش ڕادەگرێ تابەسەر زەویدا نەکەوێ ،مەگەر بەفەرمانی خۆی، بۆیە بەیناو بەین مۆڵەت ئەدات هەندێ (نیازك) دێنە خوارێ بۆ زەوی ﴿إن الله بالناس لرؤف رحيم﴾ بەڕاستی خوا بەرامبەر بەم خەڵکە، زۆر میهرەبان و دڵاوایە, ئەوەتا هەموو یاسای بوونەوەری بۆ ڕامکردووە: نایشهێڵێ ئاسمان بەربێتەوە بەسەریاندا, لەپاشا لە نەفس و دەروونی ئادەمزادیشدا هەندێ بەڵگە دەهێنێتەوە، بۆیە ئەفەرمووێ: ﴿٦٦ وهو الذى احياكم﴾ هەرئەویشە بۆ یەکەم جار گیان و ژیانی پێدان ﴿ثم يميتكم﴾ لەپاشا ئەتانمرێنێ، بەڕاستی مردن نهێنیەکی گەورەیە، کەس نازانێ چیە ﴿ثم يحييكم﴾ ئینجا گیانتان پێ ئەبەخشێتەوە، زیندووتان ئەکاتەوە ﴿إن الإنسان لكفور﴾ لەگەڵ ئەو هەموو شتانەدا بێگومان ئادەمیزاد زۆر سپڵەو، ناسوپاسە.

الجزء السابع عشر — سورة الحج

أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي الْأَرْضِ وَالْفُلْكَ تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِأَمْرِهِ وَيُمْسِكُ السَّمَاءَ أَن تَقَعَ عَلَى الْأَرْضِ إِلَّا بِإِذْنِهِ ۗ إِنَّ اللَّهَ بِالنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿٦٥﴾ وَهُوَ الَّذِي أَحْيَاكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ۗ إِنَّ الْإِنسَانَ لَكَفُورٌ ﴿٦٦﴾ لِّكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنسَكًا هُمْ نَاسِكُوهُ ۖ فَلَا يُنَازِعُنَّكَ فِي الْأَمْرِ ۚ وَادْعُ إِلَىٰ رَبِّكَ ۖ إِنَّكَ لَعَلَىٰ هُدًى مُّسْتَقِيمٍ ﴿٦٧﴾ وَإِن جَادَلُوكَ فَقُلِ اللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿٦٨﴾ اللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِيمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿٦٩﴾ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ ۗ إِنَّ ذَٰلِكَ فِي كِتَابٍ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ ﴿٧٠﴾ وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَانًا وَمَا لَيْسَ لَهُم بِهِ عِلْمٌ ۗ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِن نَّصِيرٍ ﴿٧١﴾ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا بَيِّنَاتٍ تَعْرِفُ فِي وُجُوهِ الَّذِينَ كَفَرُوا الْمُنكَرَ ۖ يَكَادُونَ يَسْطُونَ بِالَّذِينَ يَتْلُونَ عَلَيْهِمْ آيَاتِنَا ۗ قُلْ أَفَأُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكُمُ ۗ النَّارُ وَعَدَهَا اللَّهُ الَّذِينَ كَفَرُوا ۖ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ ﴿٧٢﴾

٣٤٠ — يٰأيها الناس

**هەر کۆمەڵێك پێودان ودەستوورێکی هەبووە:**

﴿٦٧ لكل أمة جعلنا منسكا﴾ ئینجا ڕوو ئەکاتە پەیامبەر ﷺ کەگوێ بەلاسارییەکانی قورەیش نەدات، چونکە بۆ هەرئوممەتێك بەرنامەو جۆرە خواپەرستییەکی تایبەتمان داناوە ﴿هم ناسكوه﴾ کەئەوان هەر ئاوا ئەنجامی بدەن

و پەیڕەوی بکەن ﴿فلا ینازعنك فی الأمر﴾ جاکەواتە ئەوانە حەقیان نیە سەبارەت بەو فەرمانەی تۆ هێناوتە کێشە کێشت لەگەڵ بکەن ,چونکە هەموو گەل و چەرخێك سیستمێکی تایبەتی خۆی هەبووە، تۆیش ئەی پێغەمبەر!سیستمی ئەم ئوممەت و چەرخەت هێناوە، ئیتر ئەوانە بۆیان ڕەوا نیە کێشەو ناکۆکی بنێنەوە وەك دەفەرمووێ: (ولا یصدنك عن آیات الله بعد إذ أنزلت إلیك). ﴿وادع إلى ربك﴾ تۆ بەردەوام بانگەواز بکە بۆلای ئایینی پەروەردگارت و بۆ پەرستنی ئەو ﴿إنك لعلى هدى مستقیم﴾ چونکە تۆ لەسەر ڕێبازو ڕێگەیەکی هەق و ڕاستیی ,جاکەوایە دڵنیاو، پشت ئەستوور بە ﴿[٦٨] وإن جادلوك فقل: الله أعلم بما تعملون﴾ خۆ ئەگەر کەوتنە موجادەلەو دەمەدەمێ لەگەڵت، تۆ موجادەلە مەکەو بڵێ: خوا خۆی چاك ئاگادارە بەوەی ئێوە ئەیکەن ئەو خۆی ئەزانێ کەئێوە شایستەی چین هەر وەکو ئەفەرمووێ: (هو أعلم بما تفیضون فیه کفى به شهیدا بینی وبینکم) ٨/٤٨. ﴿[٦٩] الله یحکم بینکم یوم القیامة فیما کنتم فیه تختلفون﴾ هەر خوا خۆی لەڕۆژی قیامەتا داوەریی دەکا لە نێوانتاندا لەو شتانەی کەئێوە کێشەتان تێیدا هەبوو. لەجێگەیەکی تردا دەفەرمووێ: (فلذلك فادع واستقم کما أمرت ولا تتبع أهواءهم وقل آمنت بما أنزل الله من کتاب..) ١٥/٤٢. ﴿[٧٠] الم تعلم أن الله یعلم ما فی السماء و الأرض﴾ مەر تۆ نەتزانیوە ئەی مرۆڤی ژیر! کە هەرچی لەئاسمان و زەوییدایە کەخوا ئاگای لێیەتی و دەیزانێ؟ جاکەواتە هەر ئەویش بە تەنها خۆی بەئاگایە لەوشتانەدا ئێوە ئیختیلافتان تێیدا هەیە. ﴿إن ذلك فی کتاب﴾ چونکە بە ڕاستیی هەموو ئەو شتانە لە نامەی (لوح المحفوظ)دا تۆمار کراوەو "هیچیلێ زایە نابێت" ﴿إن ذلك على الله یسیر﴾ بێگومان ئەوکارەش بۆ خوا زۆر ئاسانە، هەر وەکو ئەم فەرموودەیەش دەسەڵاتی فراوانی خوا ڕادەگەیەنێ: (إن الله قدر مقادیر الخلائق قبل خلق السموات والارض بخمسین ألف سنة وکان عرشه على الماء) موسلیم. کتاب القدر ٢٠٤٤/٤. بێگومان خوا پێش دروستکردنی ئاسمانەکان و زەویی بەپەنجا هەزار ساڵ و، هەر ئەو دەمەی کە هێمان عەرشیشی بەسەر ئاوەوە بوو ئەندازە گیری و بڕیاری هەموو ڕووداوو کاروباری دروستکراوەکانی خۆیدا. ﴿[٧١] ویعبدون من دون الله ما لم ینزل به سلطانا﴾ و پێویستە بەرنامەو سەرچاوەی ژیان هەر لەبەرنامەی ئەو خواوە وەربگیردرێ, نەك وەك بێ بڕواکان لەباتی بەرنامەکەی خوا,دوای بەرنامەوشتیوا ئەکەون و، شتێکی دی ئەپەرستن، لەکاتێکدا خواش بۆپەرستنیئەوانە هیچ جۆرە پشتگیرییەکی نەناردۆتە خواری, وەك ئەفەرموێ: (ومن یدع مع الله الها آخر لا برهان له به، فإنما حسابه عند ربه إنه لا یفلح الکافرون)١١٧/٢٣. بەهەڕەشەیە لەو کەسانە بە نەفامی و گێلیخۆیان, دارو بەرد دەپەرستن!. ﴿وما لیس لهم به علم﴾ خۆیشیان هیچ جۆرە زانیارییەکیان بەشیاوییان نییە نە لەڕووی ژیریی و مەنتیقەوە, وە نە لەڕووی دین و شەرعەوە ﴿وما للظالمین من نصیر﴾ دیارە ئەو جۆرە کەسانە ستەمکارن، وە ستەمکارانیش هیچ کۆمەك کارو پشتیوانێکیان نیە ﴿[٧٢] وإذا تتلى علیهم آیاتنا بینات﴾ کاتێ ئایەتە ڕوون و ئاشکراکانی ئێمەشیان بەسەرا بخوێنرێ ﴿تعرف فی وجوه الذین کفروا المنکر﴾ لەدەم و چاوو دیمەنی بێبڕواکاندا گرژیی و تاڵی و ئینکاری دەبینیی ﴿یکادون یسطون بالذین یتلون علیهم آیاتنا﴾ بەجۆرێکی وا نزیکە بەمستەکۆڵە هێرش و هەڵمەت بەرنە سەر ئەوانەی کە ئایەتەکانی ئێمەیان بەسەردا ئەخوێننەوە ﴿قل افأنبئکم بشر من ذلکم النار وعدها الله الذین کفروا﴾ پێیان بڵێ: ئایا هەواڵتان بدەمێ چی لەوە خراپترە، مەگەر هەر ئەو ئاگرەی کە خوا بەڵێنی داوە بەبێ بڕوایان ﴿وبئس المصیر﴾ کە ئەو ئاکامە سامناکترین و خراپترینی ئاکام و جێگەیە.

**بت وبت پەرست چەن زەبوونن:**

﴿[٧٣] **یا أیها الناس ضرب مثل فاستمعوا له**﴾ ئینجا ئێستا دەدا بەگوێی هەموو بتپەرستەکاندا کە ئەو پەرستراوو بتانە کزۆڵەو لاوازن و، هیچ دەسەڵاتێکیان نیە، وەك ئەفەرموێ: ئەی خەڵکینە! نموونەیەك هێنراوەتەوە دەسا ئێوەیش چاك گوێی بدەنێ ﴿**إن الذین تدعون من دون الله**﴾ بەڕاستی لە خوا بەدەر ئەوانەی ئێوە ئەیانپەرستن و هاواریان بۆ دەبەن ﴿**لن یخلقوا ذبابا ولو اجتمعوا له**﴾ هەرگیز ناتوانن تەنها مێشێکیش بەدی بێنن، ئەگەرچی هەموویشیان کۆببنەوە، وەکو ئەم فەرمووده (قودسی)یەش دەفەرموێ: (قال الله –عز وجل– ومن أظلم ممن ذهب یخلق کخلقی؟ فلیخلقوا ذرة، فلیخلقوا شعیرة) واتە: چ کەسێ ستەمکارترە لەو کەسەی بیەوێ وەکو دروستکراوەکانی من (واتە: خوا) دروست بکا،دەسا ئەگەر دەتوانێ با بچێ تاکە مێروولەیەك، یا خود دنکە جۆیەك بەدی بێنێ! (متفق علیه). کەواتە کەی حەق و ڕەوایە ئەوانە بکرێن بەخواو بپەرسترێن؟! خۆ دروستکردنی مێش و فیل و وشتریش بۆ خوای گەورە یەکسانە، چونکە لەمێشیشدا چەندین نهێنی سەر سوڕهێنەری ژیان بەدی ئەکرێ، هەروەك لەوانی تردا بەدی ئەکرێ، بەڵام مێش لە هەموویان لاوازترە، جا کە ئەوان تاکە مێشێکیان بۆ دروست نەکرێ، دیارەچاکتر فیلێکیان بۆ دروست نابێ بەڵێ ژیان شتێکی سەر سوڕهێنەرە، بۆیە ئادەمیزادی کافرو بێ بڕوا هەر ململانێ دەکا لەئاستی بەرنامەی خاوەنی ئەم ژیانەو هەوڵیان داوە بۆ دروستکردنی بەرنامەیەکیتر و، ئاخۆ لەرووی کیمیاو ییەوە دەتوانن ژیان بەدی بێنن؟! وڵاتی (رووس) زانایەکی بەناوی (ئوبارین)ـەوە تەکلیف کرد کەهەوڵ بدات: ئایا تا چ ئەندازە یەك فەراهەم هێنانی ژیان (ایجاد الحیاة) دەست ئەدات لە ڕێگەی ئاوێتە کردنی مادده کیمیاوییەکانەوە (التفاعل الکیمیاوی)؟ ئەویش هەروا نزیکەی بیست ساڵێك خۆی بۆ یەکلا کردەوەو کاری بۆکرد، سەرەنجام لە دەوروبەری ساڵی (١٩٦٢)دا ڕایگەیاند کە: زانیاریی کیمیاویی دەستەو سانەو هیچی پێناکرێ لە تاقیگەکاندا بۆ دروستکردنی ژیان، چونکە زانیاری تەنها هەر لە بنەما هەست پێکراوەکاندا دەستی هەیە. بۆ ئەمە سەیری کتێبی (الله جل جلاله/ سعید حوی، ل ٥٦) بکە ﴿**وإن یسلبهم الذباب شیئا**﴾ نەك هەر ئەوەندە ناتوانن وە ئەگەر ئەو مێشە لاوازەش شتێك لە خۆیان و لە خواکانیان بت، گروپ، مرۆ بفڕێنێ ﴿**لا یستنقذوه منه**﴾ ناتوانن پێی بزانن و لێی بسێننەوە لەگەڵ ئەو لاوازی و بێ دەسەڵاتییەیدا، خۆ ئەمەش ئاشکرایە کە زۆرشتی مەردم ئەفڕێنێ و ناتوانێ لێی وەرگرێتەوە، لە بەر ئەمەش لەناو هەموو گیانلەبەرەکاندا، خوا بە مێش نموونە دەهێنێتەوە،چونکە مێش زۆر لاوازو بێ هێزە، لە هەمانکاتیشدا سامناکترین نەخۆشی بەخۆیەوە هەڵئەگرێ و، بەنرخترین ئەندامی ئادەمزاد لە دەست ئەدات، ئەوەتا مرۆڤ گەلێ جار

الجزء السابع عشر — سورة الحج

يَا أَيُّهَا النَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَاسْتَمِعُوا لَهُ إِنَّ الَّذِينَ
تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ لَنْ يَخْلُقُوا ذُبَابًا وَلَوِ اجْتَمَعُوا لَهُ
وَإِنْ يَسْلُبْهُمُ الذُّبَابُ شَيْئًا لَا يَسْتَنْقِذُوهُ مِنْهُ ضَعُفَ
الطَّالِبُ وَالْمَطْلُوبُ ﴿٧٣﴾ مَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ إِنَّ
اللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ ﴿٧٤﴾ اللَّهُ يَصْطَفِي مِنَ الْمَلَائِكَةِ
رُسُلًا وَمِنَ النَّاسِ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ ﴿٧٥﴾ يَعْلَمُ
مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَإِلَى اللَّهِ تُرْجَعُ الْأُمُورُ ﴿٧٦﴾
يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ارْكَعُوا وَاسْجُدُوا وَاعْبُدُوا
رَبَّكُمْ وَافْعَلُوا الْخَيْرَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ۩ ﴿٧٧﴾ سجدة
وَجَاهِدُوا فِي اللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِ هُوَ اجْتَبَاكُمْ وَمَا جَعَلَ
عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ مِلَّةَ أَبِيكُمْ إِبْرَاهِيمَ هُوَ سَمَّاكُمُ
الْمُسْلِمِينَ مِنْ قَبْلُ وَفِي هَٰذَا لِيَكُونَ الرَّسُولُ شَهِيدًا عَلَيْكُمْ
وَتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ فَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ
وَاعْتَصِمُوا بِاللَّهِ هُوَ مَوْلَاكُمْ فَنِعْمَ الْمَوْلَىٰ وَنِعْمَ النَّصِيرُ ﴿٧٨﴾

مكية ٢٣ — سُورَةُ الْمُؤْمِنُونَ — آياتها ١١٨

٣٤١

بەهۆی میکرۆبی‌مێشەوە, چاوو هەندێ لەئەندامەکانی تری لە دەست ئەدات.. نە هەر ئەوەندە، بەڵکو ژیان و ڕۆحیش لە دەست ئەدا.. چونکە دەتوانێ میکرۆبی (سیل) و (تیفۆید) و (دوسنتاریا) و.. هتد هەڵبگرێ.. باشە بەدەر لە خوا کێ ئەتوانێ مرۆڤ لەو میکرۆبەیە ڕزگار بکات؟! ﴿ضعف الطالب والمطلوب﴾ لە ڕاستییدا هەم داواکار و، هەم داوا لێکراو، پەرستیارو، پەرستراو، (بتەکان و وێنەکانیان) زۆر لاوازو بێ توانان ﴿[٧٤] وما قدروا الله حق قدره﴾ ئای بێ بڕوایان چەندە سپڵەن، چونکە بەو جۆرەیە کە دەبێ خوا بناسن، وڕێزی لێ بگرن نە یان ناسیوەو ڕێزمان لێ نە گرتووە، ئەوەتا دارو بەردو مرۆڤ و مادده دەکەنە خوا!! ﴿إن الله لقوى عزيز﴾ بە ڕاستی خوا زۆر بەهێزە و زاڵە، زۆریش بە دەسەڵات و دەسەڵاتدارە، بتەکانیش زۆر لاوازو بێ‌دەسەڵات.

**خوا لە فریشتە و لە مرۆڤ پەیامبەری هەیە:**

﴿[٧٥] الله يصطفى من الملائكة رسلا ومن الناس﴾ خوانەناسان پێیان وابوو:کە هەر لەناو ئادەمزادا پەیامبەرهەیە! بۆیە فەرمووی: خوا لە فریشتە (وەکو جوبرەئیل)و, لە مرۆڤ هەڵدەبژێرێ ودەیکاتە نوێنەر. ﴿إن الله سميع بصير﴾ بە ڕاستی خوا زۆر بیسندەی، بینایە ئەزانێ ئەوانە چی ئەڵێن و، چی ئەکەن ﴿[٧٦] يعلم ما بين أيديهم وما خلفهم﴾ هەر ئەو خوایە کاری ئێستاو، پاشە ڕۆژیان ئەزانێ، ئاگادارەچی لە پێشیانەوەیە و، چیش لە پشت سەریانەوەیە ﴿وإلى الله ترجع الأمور﴾ ودەرەنجامی هەموو کاروباری بەندەکان, تەنها بۆ لای خوا ئەگەڕێنرێتەوە.

**باش خوا بپەرستن و، جیهاد بکەن:**

دوای دەرکەوتنی بێ هێزی‌و لاوازیی پەرستراوی بێ بڕواکان.. ئینجا بۆ ئەوەی گەلی بڕواداران بەچاکی ئەرکەکانی خۆیان جێبەجێ بکەن، ڕوویان تێدەکاو ئەفەرموێ: ﴿[٧٧] يا أيها الذين آمنوا اركعوا واسجدوا﴾ ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە بەخوا! بچەمێنەوەو کڕنووش و سوژدەی بۆ بەرن،واتە: بە تێرو تەسەلی هەردەم نوێژەکانتان بکەن، بەڵێ.. دەربارەی سوژدەی دووەمی سوورەتی حەج لەناو زانایاندا دەنگە دەنگێك هەیە کە ئاخۆ سوننەتە، یا نا؟ بەڵام ئەم فەرموودەیە کەپێشەوا ئەحمەد هێناویەتی: ((فُضِّلَتْ سورةُ الحج بسجدتين، فمن لم يسجُدْهُما فلا يَقْرَأْهُما)) دەیبڕێتەوە. ﴿واعبدوا ربكم﴾ وەتەنها پەروەردگارتان بپەرستن و، کەسێکی‌تر مەکەنە سەروەرتان ﴿وافعلوا الخير﴾ وەتا دەشتوانن هەر کاری خێرو چاکە بکەن، با لەخوا نزیك ببنەوە ﴿لعلكم تفلحون﴾ وبەشکو لەدنیاو لەقیامەتدا ڕزگارو سەرفرازو بەختیاربن.

ئینجا دەچێتە سەر باسی ئەو کارە گرنگەیە کەهەموو کارە چاکەکانی‌تر بە هۆی ئەوەوە ئەمێننەوە، ئەویش جیهادە, بۆیە ئەفەرموێ: ﴿[٧٨] وجاهدوا في الله حق جهاده﴾ بەبەردەوام و، بەدڵ و داو وەك پێویستە لەڕێگەی خوادا جیهادی تێر و تەسەل بکەن و مافی جیهاد جێبەجێ بکەن و،هەرچی لەتواناتاندایە بەختی بکەن بۆ ئەو ڕێیە; چونکە بەتایبەت ئەو هەر خۆی هەڵیبژاردوون بۆ ئەو کارە گەورەیە، وەك دەفەرموێ: ﴿هو اجتباكم﴾ لەناو گەلانی تردا ئەوخۆی‌هەڵبژاردون بۆئەو شەرەفە بەڕێزو گەورەیە ﴿وما جعل عليكم في الدين من حرج﴾ وشیاوی باسە لەم دینەشدا، هیچ جۆرە شتێکی ناڕەواو قورسی نەخستۆتە سەرشانتان،تائێوە نەتوانن ئەنجامی بدەن، واتە: بڕیاری هیچ شتێکی بەسەرتانا نەداوە کەلە توانای خۆتاندا نەبێت، نە هەر ئەوەندە بەڵکو وەکو پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((بُعِثْتُ بالحنيفية السَّمْحَةِ)) بەرنامەی ئەو ئایینە هەموو کار ئاسانییەکی تێدایە (ئیمام ئەحمەد). ﴿ملة أبيكم إبراهيم﴾ جا ئێوەش هەر لەئایینی (ئیبراهیم) ی باوکتان پەیڕەوی بکەن، جۆری یەکتاپەرستیی ئایینەکەتان هەر لەئایینەکەی ئیبراهیمی باوکتانە و هەر لەویشەوە سەرچاوەی گرتووە، جا کەواتە هەرگیز ئێوە لێی‌جیامەبنەوە ﴿هو

سماكم المسلمين من قبل وفى هذا﴾ له پێشداو لەم قورئانەشدا هەر خوا ئێوەی ناوناوە موسڵمان و خۆبەدەسەوەدەر. هەم لەنامەی پەیامبەرانی پێش تۆ و هەم لەم قورئانەیشدا ناو نراون موسڵمان بەڵێ.. گەلی موسڵمان بەدرێژایی مێژوو لە عەقیدەدا یەك پەیڕەوو پرۆگرامی هەبووە، هەتا دراوەتە دەستی ئەم گەلەیە ﴿ليكون الرسول شهيدا عليكم﴾ تاپەیامبەر (موحەممەد ﷺ)شایەت بێ بەسەرتانەوە،نەخشەی ژیانتان بۆ بكێشێ و چاك و خراپتان بۆ دەستنیشان بكات ﴿وتكونوا شهداء على الناس﴾ و ئێوەش بەگەیاندنی ئەو پەیامەیە شایەت بن و مامۆستاو ڕێ نیشاندەربن بۆ خەڵكی، بەتایبەت دوای مردنی ئەو پەیامبەرە، واتە: چاك و خراپ هەر لای ئێوەوە دیاریی ئەكرێ، بەرنامەی ژیان هەر لای ئێوە دادەڕێژرێ، وەك دەفەرموێ: (وكذلك جعلناكم أمة وسطا..)١٤٣/٢. دیارە كاری جیهاد و خۆ ئامادەكردن و كاری بە كۆمەڵی دەوێ، بۆیە ئەفەرموێ: ﴿فأقيموا الصلاة وآتوا الزكاة﴾ جا كەواتە بەڕێك و پێكی لەكاتەكانی خۆیاندا نوێژەكانتان بكەن و بەشێكی سامانیشتان بە زەكات بدەن ﴿واعتصموا بالله هو مولاكم﴾ ودەست بە ئایینی خوای هەقەوە بگرن و هەر بەو نەخشەیەی ئەویش كاربكەن، چونكە تەنها هەرئەو زاتە خۆیەتی سەردارو سەروەرتان ﴿فنعم المولى ونعم النصير﴾ ئای كە چاك دۆست و چاك كۆمەككارە. بەڵێ ئابەو زەخیرەوە گەلی موسوڵمان هەموو كات دەتوانێ هەڵسێ بە جێبەجێ كردنی ئەركەكانی سەرشانی خۆی، دەتوانێ لەنهێنیەكانی بوونەوەر سوودمەند ببێ و، لە جێبكاری خراپ و فەسادا، ئیصلاح وچاكسازیی بكا، هەموو دنیاش بەرەوخێر بگۆڕێ.

دیسان زۆر شوكرانە بژێریی خوا دەكەم، كە یارمەتی دام بۆ تەواو كردنی تەفسیری سوورەتی (حەج).

كۆتایی جزمی حەڤدەیەم

و لله الحمد والمنة

*** *** ***

## ٢٣- سوورەتی ( موئمینون )لە مەككەییەو ( ١١٨ ) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتی (موئمینون)ە، یەكێكە لە سوورەتە مەككەییەكان كە هەمووكات ئەم خاڵانەی خوارەوە لە خۆ دەگرن: یەكتایی خوا، پەیام، زیندوو بوونەوە، بۆیە بە ناو نراوە سوورەتی (مؤمنون) ,كە هەتا د نیا دنیابێ ,ناوی پرشنگداری ئیمانداران هەر لەسەر زمان بێ و، هەردەم سیفەتەكانیشیان لەبیر نەچێ و، هەر بەو پێیەش كارو رفتار بكەن و، بجووڵێنەوە. ئەم سوورەتە بۆ چەسپاندنی دەسەڵات وتوانایی‌خوای باڵادەست, هەڵدەسێ بە نمایشێكی بوونەوەر لە (مرۆڤ، ئاژەڵ، رووەك و گژوگیا)، پاشان ئاسمانە رازێنراوەكان دێنێت، دیسانەوە دێتەوە سەر زەوییەو، هەندێ شتی نایاب دەخاتە پێش چاو: خورما، ترێ، زەیتوون، هەنار، میوەی جۆراوجۆرو رەنگاو رەنگ، پاشان ئەو كەشتیانەی بە قوڵایی دەریاكاندا دێن ودەچن..هتد. داستانی هەندێ لە پەیامبەران: (نووح، هوود، موسا، مەریەم و عیسای كوڕی مەریەم) – سەلامی خوایان لەسەربێت– بۆپێغەمبەر ﷺ باس دەكا، تابەرامبەر بەژان و ئازارەكانی قورەیش خۆگربێ، ئینجا لاساریی ولارێیی قورەیش سەبارەت بە راستیەكان – لەكاتێكدا وەك خۆری نیوەڕۆ ئاشكراوروونن– دەخاتە روو، بەڵگەی زیندوو بوونەوەو، هەڵوەشانەوەی بەڵگەكانی "ناهەق" بێژان. ئەو بارودۆخ و حاڵەتانەی كە بێ باوەڕان لە كاتی سەرەمەرگدا دەریان دەبڕن، بەشێوەیەك كە ئاواتی گەڕانەوە دەخوازن بۆ دونیاو

بۆ پڕکردنەوەی کەم و کوڕییەکانیان.. بەڵام هەی هەی!! بەکورتە بەباسێکی ڕۆژی قیامەت دەرگا لەخۆدادەخات کەچۆن لەوڕۆژەدا مرۆڤەکان دەبنە دوو دەستە، بەختیارو پیرۆز، بەدبەخت و ڕەنجەڕۆ، لە کاتێکا ڕشتەو بنەماڵەش لەو ڕۆژەدا هیچ ڕۆڵێکی نامێنێ" تەنها ئیمان و کارو کردەوەی چاك وسوود بەخش ئەبێ، لەگەڵ تۆمارکردنی گفتوکۆیەك لە نێوان خوای گەورەو ستەمکاراندا، کە چۆن پەروەردگار هاوارو بانگ و پاڕانەوەیان تۆمار ئەکات (ربنا أخر جنا منها فإن عدنا فإنا ظالمون...) جا لەگەورەیی ئەم سوورەتەدا (عومەری کوڕی خەتتاب) دەڵێ: کاتێوەحی بۆ پێغەمبەر ﷺ بهاتبا دەنگێکی لێ دەبیسترا وەك دەنگی هەنگ، جاپاش ماوەیەك هەموومان ڕوو لەقیبلە دەبووین و پێغەمبەر ﷺ هەردوو دەستی بەرەو ئاسمان دەکردو دەیفەموو: (اللهم زِدْنا ولا تَنْقُصْنا، وأكْرِمْنا ولا تُهِنّا، وأعْطِنا ولا تَحْرُمْنا، وآثِرْنا ولا تُؤْثِرْ علينا، وارضَ عنّا و أرْضِنا، ثم قال: لقد انزل على عشر آيات مَنْ أقامهن دخل الجنة ثم قرأ (قد أفلح المؤمنون) حتى خَتَمَ العَشْرَ)) پێشەوا ئەحمەد، ترمزیی، نەسایی.

سُورَةُ المُؤْمِنُونَ | الجُزْءُ الثَّامِنَ عَشَرَ

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ ﴿١﴾ الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ ﴿٢﴾
وَالَّذِينَ هُمْ عَنِ اللَّغْوِ مُعْرِضُونَ ﴿٣﴾ وَالَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَاةِ
فَاعِلُونَ ﴿٤﴾ وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ ﴿٥﴾ إِلَّا عَلَىٰ
أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ ﴿٦﴾
فَمَنِ ابْتَغَىٰ وَرَاءَ ذَٰلِكَ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْعَادُونَ ﴿٧﴾ وَالَّذِينَ هُمْ
لِأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَاعُونَ ﴿٨﴾ وَالَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَوَاتِهِمْ
يُحَافِظُونَ ﴿٩﴾ أُولَٰئِكَ هُمُ الْوَارِثُونَ ﴿١٠﴾ الَّذِينَ يَرِثُونَ
الْفِرْدَوْسَ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴿١١﴾ وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ مِنْ
سُلَالَةٍ مِنْ طِينٍ ﴿١٢﴾ ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَكِينٍ ﴿١٣﴾ ثُمَّ
خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا
الْمُضْغَةَ عِظَامًا فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا ثُمَّ أَنْشَأْنَاهُ خَلْقًا
آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ ﴿١٤﴾ ثُمَّ إِنَّكُمْ بَعْدَ ذَٰلِكَ
لَمَيِّتُونَ ﴿١٥﴾ ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ تُبْعَثُونَ ﴿١٦﴾ وَلَقَدْ
خَلَقْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعَ طَرَائِقَ وَمَا كُنَّا عَنِ الْخَلْقِ غَافِلِينَ ﴿١٧﴾

وَأَنزَلْنَا مِنَ | ٣٤٢

### ئەم بڕوادارانەن سەرفراز:

﴿بسم الله الرحمن الرحيم *[١] قد أفلح المؤمنون﴾ بە ڕاستی خەڵکانی خاوەن ئیمان وبڕوادار سەرکەوتوو ڕزگارن، چونکە خاوەنی ئەم سیفەتە بەرزانەن کە خوا لە بارەیانەوە دەفەرموێ: ﴿[٢] الذين هم فى صلاتهم خاشعون﴾ ئەوانەن کە لە نوێژەکانیاندا خۆشکێن و ملکەچن و، هەردەم بە ترسەوە نوێژ ئەکەن و بەرامبەر بە خوا ئەهلی شەرمن، ئەوەی کەپێغەمبەر ﷺ لەبارەی نوێژەوە بە (بیلال)ی فەرموو: ((یا بِلالُ أرِحْنا بالصلاة)) واتە: ئادەی بیلال بەنوێژەکە بمانحەوێنەوە، پڕ بەبالأیانە (رواه الإمام أحمد). ﴿[٣] والذين هم عن اللغو معرضون﴾ ئەوانەشن کە لە بەرامبەر کارو کرداری پڕوو پووچ و، شتی بێ مانا وبێ سوود، ڕووهەڵدەسووڕێنن و پشت هەڵدەکەن، وەك خوا لە جێیەکی تردا لە بارەیانەوە ئەفەرموێ: (وإذا مروا باللغو مروا كراما) ٢٥/٣٢. ﴿[٤] والذين هم للزكاة فاعلون﴾ ئەوانەشن وا بە هەژارو بێنەوایان زەکات دەدەن ﴿[٥] والذين هم لفروجهم حافظون﴾ ئەوانەشن پارێزەری داوێنیانن، خۆیان لە هەموو ڕێگەیەکی یاساغ و ناشەرعیی دەپارێزن، وە لە جێبە جێ کردنی ئارەزووەکانیان خۆراگرن ﴿[٦] إلا على ازواجهم او ما ملكت ايمانهم﴾ مەگەر لەگەڵ هاوسەری خۆیان، یان لەگەڵ کەنیزانیان (ئەوانەی موڵکی خۆیانن) ﴿فإنهم غير ملومين﴾ جا بێگومان لەو ڕێیەوە لۆمە کراو نابن و لێیان ناگیرێ ﴿[٧] فمن ابتغى وراء ذلك﴾ ئینجا هەر کەسێ لە غەیری ئەو ڕێگایەوە هەوڵ بدا بۆ جێبەجێکردنی ئارەزووی خۆی، وەك زیناو نێربازیی و.. ﴿فأولئك هم العادون﴾ ئەو جۆرە کەسانە ئەوەرەفتاریان بێت, دەست درێژکەروسنوور بەزێنێکیلە ئەندازەبەدەرن. ئیمامی (شافعی) و، دەستەیەکی تر لەزانایان، ئەم ئایەتەی: (فمن ابتغى وراء ذلك...) دەکەنە بەڵگە بۆ حەرامیەتی

(ئیستیمنا) واتە: ئاوهێناوە بە دەست. ﴿٨ والذين هم لأماناتهم وعهدهم راعون﴾ ئەوانەشن کە چاودێرو ڕاگری سپاردەو بەڵێن و پەیمانی خۆیانن،بۆ هەر سپاردەو، ئیمزاو مۆرو نووسین و بەڵێن و قسەیەکی خۆیان بایەخ دادەنێن ﴿٩ والذين هم على صلواتهم يحافظون﴾و ئەوانەشن کە لەسەر نوێژەکانیان دەوامکارن و دەیانپارێزن و،تەممەڵییان تێدا ناکەن و، نایان فەوتێنن، وەلە کاتی خۆیاندا بە تەواوی پایەو مەرجەکانیانەوە جێبەجێیان دەکەن.

جا لە پێشەوە باسی ئەوانەی کرد کە لە نوێژەکانیاندا هەمیشە بۆ خوا کزو ملکەچن، ئینجا باسی ئەوانەشی کرد کە بایەخی ئەدەنێ و ئەیپارێزن، بۆیە پێغەمبەر ﷺ کە (عەبدوڵڵای کوری مەسعوود) لێیدەپرسێ:چ کارێ لای خوا لەهەمووشتێ خۆشەویسترە؟ ئەویش دەفەرموێ: ((الصلاةُ على وقتِها)) نوێژ کردنە لە کاتی خۆیدا، لە پاشان لێپرسییەوەوگوتی: ئەی‌پاش ئەوە؟ فەرمووی: ((بِرُّ الوالِدَيْنِ)) چاکە کردن لەگەڵ باوك و دایك. دیسانەوە لێپرسییەوە: ئەی پاش ئەوە؟ فەرمووی: ((الجهادُ في سبيل الله)) جیهاد کردن لەبەرئایینی خوا. ئیمامی (بوخاریی و موسلیم).﴿١٠ اولئك هم الوارثون﴾ هەرئەوانەن میراتگران و خاوەنی بەهەشت ﴿١١ الذين يرثون الفردوس﴾ ئەوانەی دەبنە خاوەنی (فیردەوسی) بەهەشتی بڵند و بەمیرات ئەیبەن، چونکە ڕەنج و ئازارێکی زۆریان بۆ کێشاوە، بۆیە جگە لەوان کەسێکی تر شیاوی ئەوە نیە ﴿هم فيها خالدون﴾ بەهەتا هەتاییش تیایا ئەمێننەوە، بەڵێ، ئەو سیفەتانە کەسایەتیی و تایبەتمەندییەکانی موسڵمانان دەست نیشان ئەکەن، نیشانەی کۆمەڵ و کۆمەڵگەی بڕواداران دیاری دەکەن. هەر بەو سیفەتانەش لەبێ بڕوایان جیا ئەبنەوە، هێمای بەکامڵبوونی ئادەمین و، هەر بەوانەش دەبنە مرۆڤی ڕاستەقینە، نەك ئەوانەی کە وەك ئاژەڵ هەر ئەخۆن و ئەخەون، بێ ئەوەی هیچ تەکلیف و پێویستییەك جێبەجێ بکەن، ئەم ئایەتە: (تلك الجنة التي نورث من عبادنا من كان تقيا)١٩/٦٣. یان ئەم ئایەتەش: (وتلك الجنة أورثتموها بما كنتم تعملون)٤٣/٧٢، هەردووئەو مانایە دووپات دەکەنەوە.

**بەدیهێنانی مرۆڤ, نیشانەی دەسەڵاتی خوایە :**

﴿١٢ ولقد خلقنا الإنسان من سلالة من طين﴾ بێگومان ئێمە مرۆڤی یەکەممان لەپاڵاوتەو پوختەیەك لەقوڕ" بەدی هێنا ﴿١٣ ثم جعلناه نطفة في قرار مكين﴾ لەپاشان نەوەکەیمان کردە تنۆکە ئاوێك (نوتفە) و لەبنکەو قەرارگایەکی زۆر مەحکەمدا دامان مەزراندو لەنگەرمان پێگرت, واتە: خستمانە جێگایەکی زۆر ئارام و زۆر قایمەوە کە منداڵدانە ﴿١٤ ثم خلقنا النطفة علقة﴾ لەپاشان (مەنی)یەکەمان کردە خوێنپارەیەك وخۆی بەدیواری منداڵداندا‌هەڵواسیی ﴿فخلقنا العلقة مضغة﴾ خوێنپارەکەشمان کردە گۆشتپارەیەك ﴿فخلقنا المضغة عظاما﴾ جا ئەو پارچە گۆشتەیشمان کردە کرۆك و ئێسك، خانەکانی ئێسکمان تیا دروستکرد ﴿فكسونا العظام لحما﴾ ئینجا گۆشتمان کرد بەبەر ئێسکەکاندا.بەڵێ.. چەندین ساڵە قورئان ئەم ڕاستییەی تۆمار کردووەکە:خانەکانی ئێسك بەر لەخانەکانی گۆشت پێك دێن،ئەمەش تازە زانیاریی دەرکی پێکردووە!(عەبدوڵڵای کوری مەسعوود) ئەڵێ: پێغەمبەری هەمیشە ڕاست بێژمان فەرمووی: ((إنَّ احدكُم لَيُجمَعُ خَلْقُهُ في بطن امه في اربعين يوما، ثم يكونُ عَلَقَةً مثل ذلك، ثم يكون مُضْغَةً مثل ذلك، ثم يُرْسِلُ الله إليه المَلَكَ فيَنْفُخُ فيه الروحَ، ويُؤْمَرُ بأربع كلماتٍ: رِزْقِهِ، وأَجَلِه، وعَمَلِهِ، وهل هو شَقِيٌّ أو سَعيدٌ...)) واتە: بێگومان، هەریەك لەئێوە چل ڕۆژ بەنوتفەیی لەمنداڵدانی دایکیدا دەمێنێتەوە، دیسان چل ڕۆژی تر بەخوێنپارەیی، ئەوسا کەبووە گۆشتپارەش هەروا، واتە: تائەوسێ قۆناغە (١٢٠) ڕۆژ دەبڕێ، یادەڵێن: چوار مانگ دەچێ، ئەوجا خوای باڵادەست فریشتە دەنێرێ و، فوی پیادەکاو، (ڕۆح) دەکرێ

بەبەریا! ئیتر هەرلەو کاتەوە چوارشتی بۆدیاری دەکرێ: ڕزق و ڕۆزی، تەمەن وئاکامیی، کاروکردەوەی،
چارەنووسیی (بەد بەختیی،یان بەختیاریی).. بوخاریی، کتاب الأنبياء ٦/٣٦٣، موسلیم. کتاب القدر، ٤/٢٠٣٦.
﴿ثم انشأناه خلقا آخر﴾ پاشان کردمانە شێوەی دروستکراوێکی تر، واتە: گیانمان کرد بەبەردا. بەڵێ.. ئادەمزاد ئا
بەو شێوە دروستکران قورئان باس ئەکات بۆمان.. هەروەك گیانلەبەرانی تر، بەڵام خوای گەورە هەندێ شتی
تایبەتی بەم بەخشیوەو، لەئاژەڵ جیایکردەوەو، ئاژەڵ هەر لەجێگەی خۆیدا مایەوە. وەك ئەفەرمووێ: ﴿فتبارك الله
احسن الخالقين﴾ زۆر گەورەو پڕ بەرەکەتە ئەوخوایەی کە باشترینی دروستکەرانەو، هەر ئەویشە دەس ڕەنگین،
چونکە غەیری ئەو تەنها وێنەو نیگار ئەکێشن، بەڵام ئەوخوا گەورەیە بەوتنۆکە ئاوە ئەو هەموو قۆناغانە ئەبڕێ،
پاشان ئەبێتە ئەو مرۆڤەو گیان ئەکات بەبەریا! ﴿[١٥] ثم إنكم
بعد ذلك لميتون﴾ پاشان بەڕاستیی دوای ئەوهەموو ژیان
وبڕینی قۆناغانە ئێوە گشت ئەمرن ﴿[١٦] ثم إنكم يوم القيامة
تبعثون﴾ دوایی بۆجارێکیتر هەر ئێوە لەڕۆژی قیامەتدا
زیندوو دەکرێنەوەو گیان دەکرێتەوە بەبەرتانا.

**بەدیهێنانی ئاسمان و باران و شین بوونی ڕووەك:**

﴿[١٧] ولقد خلقنا فوقكم سبع طرائق﴾ بەڕاستیی ئێمە
بەلای سەرووتانەوە حەوت نهۆم ئاسمانمان دروستکرد.
(طرائق): بە چەند پارچەیەك دەڵێن، کە هەندێکی لەبان
هەندێکی بێت، یان هەندێکی بەلای سەرووی ئەوی
تریەوەبێت، خۆ لەوانەیشە مەبەست بەوە، حەوت خولگە
بێت، یان حەوت کۆمەڵە ئەستێرە بێت، وەکو کۆمەڵەی
خۆر.. یان.. یان..هتد، ئەگەرچی خوای گەورەش باشتر
دەزانێ بەمەبەستی خۆی ﴿وماكنا عن الخلق غافلين﴾ و
ئێمە بەتەگبیرو حیکمەت دروستمانکردوون و، هەرگیز
لەدروستکراوەکانیشمان غافڵ و بێ ئاگانین ﴿[١٨] وانزلنا من
السماء ماء بقدر﴾ وە لەوئاسمانەوە بەئەندازەیەکی
دیاریکراو، ئاومان بۆتان باراندە خوارێ، بەجۆرێ کە نە ئەوەندە زۆر بێت مەردم بخنکێنێ، وە نەوەئەوەندەیش کەم
بێت کە: تۆمەی زەویی و، گژوگیاوشك ببێ‌و نەڕوێ ﴿فاسكناه فى الأرض﴾ ئینجا لە زەوییدا لەجێگایەکی تایبەتدا
جێمان پێدا ورامانگرت و، کردمانە پاشەکەوت. بەدەریاچە، یان بەکانی و سەرچاوە ﴿وإنا على ذهاب به لقادرون﴾
وە لەهەمان کاتیشدا ئێمە دەتوانین لەناوی بەرین و لەناو سکی زەوییدا، یان لەناو بەردە خڕەکاندا گومی بکەین.
بەڵێ ئاو سەرچاوەی ژین و ژیانە، بۆیە ئەفەرموێ: ﴿[١٩] فانشانا لكم به جنات من نخيل واعناب﴾ سا هەر بەهۆی
ئەو ئاوەوە گەلێ باخە خورماو باخە ترێمان بۆتان بەدی هێنا ﴿لكم فيها فواكه كثيرة﴾ لەو باخانەدا میوەهاتی
جۆراوجۆری زۆرمان بۆ بەدیهێنان ﴿ومنها تأكلون﴾ کە لەبەرهەمەکانیشیان ئەخۆن، لە هاوین و زستان و وەرزەکانی
تر ﴿[٢٠] وشجرة تخرج من طور سيناء﴾ وە هەروەها جۆرە درەختێکیش,واتو: زەیتوون کە لەکێوی تووری سینادا

الجزء الثامن عشر — سورة المؤمنون

وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءَۢ بِقَدَرٖ فَأَسۡكَنَّٰهُ فِي ٱلۡأَرۡضِۖ وَإِنَّا عَلَىٰ ذَهَابِۭ
بِهِۦ لَقَٰدِرُونَ ١٨ فَأَنشَأۡنَا لَكُم بِهِۦ جَنَّٰتٖ مِّن نَّخِيلٖ وَأَعۡنَٰبٖ
لَّكُمۡ فِيهَا فَوَٰكِهُ كَثِيرَةٞ وَمِنۡهَا تَأۡكُلُونَ ١٩ وَشَجَرَةٗ تَخۡرُجُ مِن
طُورِ سَيۡنَآءَ تَنۢبُتُ بِٱلدُّهۡنِ وَصِبۡغٖ لِّلۡأٓكِلِينَ ٢٠ وَإِنَّ لَكُمۡ فِي
ٱلۡأَنۡعَٰمِ لَعِبۡرَةٗۖ نُّسۡقِيكُم مِّمَّا فِي بُطُونِهَا وَلَكُمۡ فِيهَا مَنَٰفِعُ كَثِيرَةٞ
وَمِنۡهَا تَأۡكُلُونَ ٢١ وَعَلَيۡهَا وَعَلَى ٱلۡفُلۡكِ تُحۡمَلُونَ ٢٢ وَلَقَدۡ
أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ فَقَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ
غَيۡرُهُۥٓۚ أَفَلَا تَتَّقُونَ ٢٣ فَقَالَ ٱلۡمَلَؤُاْ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦ مَا هَٰذَآ
إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُكُمۡ يُرِيدُ أَن يَتَفَضَّلَ عَلَيۡكُمۡ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَأَنزَلَ
مَلَٰٓئِكَةٗ مَّا سَمِعۡنَا بِهَٰذَا فِيٓ ءَابَآئِنَا ٱلۡأَوَّلِينَ ٢٤ إِنۡ هُوَ إِلَّا
رَجُلُۢ بِهِۦ جِنَّةٞ فَتَرَبَّصُواْ بِهِۦ حَتَّىٰ حِينٖ ٢٥ قَالَ رَبِّ ٱنصُرۡنِي
بِمَا كَذَّبُونِ ٢٦ فَأَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡهِ أَنِ ٱصۡنَعِ ٱلۡفُلۡكَ بِأَعۡيُنِنَا
وَوَحۡيِنَا فَإِذَا جَآءَ أَمۡرُنَا وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ فَٱسۡلُكۡ فِيهَا مِن
كُلّٖ زَوۡجَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِ وَأَهۡلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيۡهِ ٱلۡقَوۡلُ
مِنۡهُمۡۖ وَلَا تُخَٰطِبۡنِي فِي ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ إِنَّهُم مُّغۡرَقُونَ ٢٧

٣٤٣

دێتە دەر ﴿تنبت بالدهن وصبغ للآكلين﴾ شین دەبێ بەهەڵگرتنیڕۆن و چەوری و پێخورەوە بۆ بخۆران، واتە: هەر ئا بەوجۆرە لەو جێگایەدا دارێکی قەشەنگمان سەوز کردووە، کە هەم زەیتی هەیەو، هەم ڕۆنی لێ ئەگیرێ بۆ خواردن، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمووێ: ((كلوا الزيت وادهنوا به فإنه من شجرة مباركة))، واتە: لەڕۆنی زەیت بخۆن و، سەریشی پێچەور وئارایش بدەن، چونکە لە درەختێکی پیرۆزە. أخرجه الإمام أحمد٣/٤٩٧. ﴿[21] وإن لكم فی الأنعام لعبرة﴾ بەڕاستیی لە بەدیهێنانی مەڕو بزن و گاو وشتردا پەندی فراوان و زۆرتان بۆ هەیە، کە حەقوایە بیانکەن بەبەڵگە لەسەر بوونی خوا... ﴿نسقيكم مما فی بطونها﴾ وەلەوەی کە لە سکیاندایە پێتانی دەنۆشین، واتە:بە شیرەکەیان- کە لەنێوان خوێن و سەڕواندا پەیدا ئەبێ- سوودمەند ئەبن و ئەیخۆنەوە ﴿ولكم فيها منافع كثيرة﴾ بەهرە و کەڵکی تری زۆریان بۆتان هەیە: خوریی و موو کورکەکەیان بەکار دێنن بۆ پێویستییەکانتان ﴿ومنها تأكلون﴾ لێشیان ئەخۆن ﴿[22] وعليها وعلى الفلك تحملون﴾ وە لەسەر پشتی هەندێ لەوئاژەڵانەو، لەسەر کەشتیەکان هەڵئەگیرێن و ئەگوێزرێنەوە. لە چەند سوورەتێکی دیکەشدا هەندێ لەو نیعمەتانە بەگەلانی پێشوویدا باس دەکا, لەگەڵ ئەوەدا کە بەهیچ شێوەیەك بیریان لەو هەموو بەهرانەی خوا نەکردەوەو سوودیان لێوەر نەگرتن، وەك ئەفەرموێ: (وتحمل أثقالكم إلى بلد لم تكونوا بالغيه إلا بشق الأنفس إن ربكم لرؤف رحيم)١٦/٧، یان (وذللناها لهم فمنها ركوبهم ومنها يأكلون ولهم فيها منافع ومشارب أفلا يشكرون)٣٦/٧٢-٧٣. خوا – بۆنموونە- چوار شتی گرنگی بۆ نیشانەی دەسەڵات و توانایی خۆی باسکرد، تا ببنە هۆی بڕوا هێنان: شێوەی دروستکردنی ئادەمیزاد، کە ئەو هەموو ئاڵو گۆڕەی بەسەردا دێت: ئاسمانەکان، باراندنی باران، دارو درەخت، ئاژەڵ و جۆرەها هۆی دیکە بۆ کەڵك لێ وەرگرتن.

## نووح عليه السلام دەچێتە لای هۆزەکەی:

دوای باسکردنی ئەو هەموو نازو نیعمەتە بۆئادەمزاد, ئیستاش باسێکی(نووح) دەکاو دەفەرموێ: ﴿[23] ولقد ارسلنا نوحا إلى قومه﴾ بێگومان ئێمە (نووح) ی پەیامبەرمان عليه السلام نارده لای هۆزەکەی خۆی، تاهۆشیاریان بکاتەوە ﴿فقال يا قوم اعبدوا الله مالكم من إله غيره﴾ ئەوسا پێیگوتن: ئەی هۆزەکەم! تەنها خوا بپەرستن" چونکە جگە لەوهیچ پەرستراوێکیتری راستەقینە بۆئێوە نیە ﴿أفلا تتقون﴾ دە ئایا هێشتا ناترسن و پارێز ناکەن لەپەرستنی غەیری ئەوو" کۆتایی ناهێنن؟ ﴿[24] فقال الملأ الذين كفروا من قومه﴾جا گەورە گەورەکانی هۆزەکەی، -کە خوانەناس و بێ وەڕ بوون- وتیان: ﴿ما هذا إلا بشر مثلكم يريد ان يتفضل عليكم﴾ ئەم (نووح)یش هەر مرۆڤێکە وەکو ئێوە, هیچ پلەو پایەیەکی لەئێوە زیاتر نیە! ئەیەوێ خۆی بەسەر ئێوەدا زاڵ بکا، جاکەوابوو وریابن! نەخەڵەتێن ﴿ولوشاء الله لأنزل ملائكة﴾ سەرباری ئەوەش ئەگەر خوا ویستبای پەیامبەرێك بنێرێ, فریشتەی ئەنارد، نەك ئادەمیی، جا کەوایە با ئەوهەربۆخۆی بڵێ، ئێوەش بەگوێی مەکەن ﴿ما سمعنا بهذا فی آبائنا الأولين﴾ ئەم قسەو باسە کە نوح ئەیکا(دوای پێغەمبەرێتی و,یەکخواپەرستی) تا ئێستا ئێمە لەباوو باپیرانمانەوە نەمان بیستووە، کەوایە باهەر بۆخۆی بڵێ ﴿[25] إن هو إلا رجل به جنة﴾ دیارە ئەو هیچ بەڵگەیەکی بەدەستەوە نیە، سەرەڕای ئەوەش، بەبۆچوونی ئێمە, هەر پیاوێکە تووشی نەخۆشی شێتی بووە و عەقڵی تێك چووە ﴿فتربصوا به حتى حين﴾ وا باشە تا ماوەیەك خۆتان بگرن و چاوەڕوان بن,هەتا شێتیەکەی نامێنێ یا لە ناو ئەچێ، یان بەشکو بگەڕێتەوە سەر بەرنامەو ئایینەکەی ئێوە، دیارە ئەم بۆچوونەیان, بۆچوونێکی پووچەڵ و بێ ناوەڕۆکە، بۆیە خوا نەوەڵامیانیدایەوەو، نە بایەخی پێدان، ئینجا (نووح)یش بۆی دەرکەوت کە قەومەکەی گومڕایی و سەر لێشێواوی

چەتری رەشی بەسەردا هەڵداون وچاك نابن, بۆیە ﴿قال رب انصرنی بما كذبون﴾ وتی: پەروەردگارم! دەسا یارمەتیم بدەو سەرمخە، چونکە ئەوان منیان بەدرۆزن داناو باوەڕیان پیٚ نەکردم. ئینجا خوا وەلأمیدایەوەوفەرمووی: ﴿[٢٧] فأوحينا إليه ان آصنع الفلك بأعيننا ووحينا﴾ ئیٚمە سروشمان بۆ نووح کرد: لە ژیٚر چاودیٚریی وفەرمانی ئیٚمە دا, کەشتییەك دروست بکە ﴿فإذا جاء امرنا﴾ ئینجا هەرکە وادەی بڕیارمان بۆ لەناو بردنیان هات ﴿وفار التنور﴾ وئاولەتەنوور وجیٚگانان کرنەکەیاندا هەڵقوڵی وفەوارەیکرد- ئەمەش نیشانەی لەناو بردنیانە- ﴿فاسلك فيها من كل زوجين اثنين﴾ لەهەموو جۆرەگیانلەبەرو کائیناتیٚکی زیندو, جووتە نیٚرو میٚیەکی بخە ناو ﴿واهلك إلا من سبق عليه القول منهم﴾ هەروەها خیٚزان و کەس و کارو بنەماڵەکەی خۆیشت، ئەوانەیان نەبیٚت- ژنەکەت وکوڕەکەت- کە پیٚشتر بڕیاری غەرقبوون و تیاچوونیان بۆ دراوە ﴿ولا تخاطبنى فى الذين ظلموا﴾ سەبارەت بەوانەی کە ستەمکار بوون وباوەڕیان نەهیٚنا, قسەم لەگەڵ مەکە بۆ ڕزگار بوونیان ﴿إنهم مغرقون﴾ چونکە بەڕاستیی ئەوانە لە نقوم کراوان و تیاچووانن لەزەریانەکەدا ﴿[٢٨] فإذا استويت انت ومن معك فى الفلك﴾ جاکاتیٚ خۆت و ئەوانەی لەگەڵتان لەسەر کەشتییەکە سوار بوون و جیٚگیر بوون ﴿فقل الحمد لله الذى نجانا من القوم الظالمين﴾ بڵیٚ: سوپاسی تەواوو و شیاو هەر بۆ ئەو خوایەیە وا لەدەست هۆزی ستەمکار ڕزگاری کردین، لەسوورەتیٚکی تردا• نموونەی ئەوە هاتووە وئەوفەرمویٚ: (وجعل لكم من الفلك والأنعام ما تركبون لتستووا على ظهوره ثم تذكروا نعمة ربكم إذا استويتم عليه وتقولوا سبحان الذى سخر لنا هذا وما كنا له مقرنين وإنا إلى ربنا لمنقلبون)٤٣/١٢،١٤ ﴿[٢٩] وقل رب انزلنى منزلا مباركا﴾ کاتیٚکیش بە سەلامەت گەیشتیت و ویستت لەکەشتیەکە دابەزیت بڵیٚ: پەروەردگارم! لەجیٚگایەکی پیرۆزو بەپیت دامبەزیٚنەو نیشتەجیٚم بکە, لەخراپەو شەڕدوور رامگرە ﴿وانت خير المنزلين﴾ چونکە تۆ باشترین زاتیٚکی بۆ نیشتەجیٚکردنی بەندەکانت, دەرەنجام لەکوردستان کەشتیەکە لەنگەری گرت. ﴿[٣٠] إن فى ذلك لآيات﴾ بەڕاستییلەوبە سەرهاتەی هۆزی (نووح)دا, گەلیٚ بەڵگەی عیبرەت هەیە بۆ خاوەن عەقڵەکان ﴿وإن كنا لمبتلين﴾ خۆ بەڕاستیی ئیٚمە تاقیکەرەوە بووین بۆ هۆزەکەی نووح,ویستمان بیان ئەزموێنین.

**تیٚبینی:** ئەم بەسەرهاتەی قەومی (نووح) عليه السلام لەئایەتەکانی (٢٥-٤٨)ی سوورەتی (هوود) زیاتر روونکراوەتەوە.



فَإِذَا ٱسْتَوَيْتَ أَنتَ وَمَن مَّعَكَ عَلَى ٱلْفُلْكِ فَقُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى نَجَّىٰنَا
مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٨﴾ وَقُل رَّبِّ أَنزِلْنِى مُنزَلًا مُّبَارَكًا وَأَنتَ خَيْرُ
ٱلْمُنزِلِينَ ﴿٢٩﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ وَإِن كُنَّا لَمُبْتَلِينَ ﴿٣٠﴾ ثُمَّ أَنشَأْنَا
مِنۢ بَعْدِهِمْ قَرْنًا ءَاخَرِينَ ﴿٣١﴾ فَأَرْسَلْنَا فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ أَنِ ٱعْبُدُوا۟
ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ۖ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٣٢﴾ وَقَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِهِ
ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِلِقَآءِ ٱلْءَاخِرَةِ وَأَتْرَفْنَٰهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا
مَا هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يَأْكُلُ مِمَّا تَأْكُلُونَ مِنْهُ وَيَشْرَبُ مِمَّا
تَشْرَبُونَ ﴿٣٣﴾ وَلَئِنْ أَطَعْتُم بَشَرًا مِّثْلَكُمْ إِنَّكُمْ إِذًا لَّخَٰسِرُونَ
﴿٣٤﴾ أَيَعِدُكُمْ أَنَّكُمْ إِذَا مِتُّمْ وَكُنتُمْ تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَنَّكُم مُّخْرَجُونَ
﴿٣٥﴾ ۞ هَيْهَاتَ هَيْهَاتَ لِمَا تُوعَدُونَ ﴿٣٦﴾ إِنْ هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا
ٱلدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ ﴿٣٧﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا رَجُلٌ
ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا وَمَا نَحْنُ لَهُۥ بِمُؤْمِنِينَ ﴿٣٨﴾ قَالَ رَبِّ
ٱنصُرْنِى بِمَا كَذَّبُونِ ﴿٣٩﴾ قَالَ عَمَّا قَلِيلٍ لَّيُصْبِحُنَّ نَٰدِمِينَ ﴿٤٠﴾
فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّيْحَةُ بِٱلْحَقِّ فَجَعَلْنَٰهُمْ غُثَآءً ۚ فَبُعْدًا لِّلْقَوْمِ
ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤١﴾ ثُمَّ أَنشَأْنَا مِنۢ بَعْدِهِمْ قُرُونًا ءَاخَرِينَ ﴿٤٢﴾

## داستانەکەی عادو سەموود:

﴿٣١ ثم انشأنا من بعدهم قرنا آخرين﴾ ئنجا دوای هۆزی نووح،نەوەو گەلێکی ترمان (هۆزی عاد) بەدی هێنا ﴿٣٢
فأرسلنا فيهم رسولا منهم﴾ هەر لەناو خۆشیاندا پەیامبەرێکمان (هوود)(عليه السلام) بۆ ناردن ﴿أن اعبدوا الله مالكم من إله
غيره﴾ کە پێیان بڵێ: هەرخوا بەتاك و تەنها بپەرستن، چونکە بێجگە لەو زاتە پەرستراوێکی تری واتان نىیە بۆ
پەرستن بشێ ﴿افلا تتقون﴾ دە ئایا لێی ناترسن و، پارێز ناکەن ﴿٣٣ وقال الملأ من قومه الذين كفروا وكذبوا بلقاء
الآخرة واترفناهم في الحياة الدنيا﴾ بەڵام گەورە گەورەو دەمراسانی هۆزەکەی- ئەوانەیان باوەڕیان بەدیداری
گەیشتن بەپاشەڕۆژ نەبووبەدرۆیان دەزانی، وە لەژیانی دونیاشدا نازو نیعمەتێکی زۆرمان پێدابوون- وتیان: ﴿ما
هذا إلا بشر مثلكم﴾ ئەم پێغەمبەرە! مرۆیە کە, هەر وەك ئێوە زیاتر نیە لەوە،واتە: نە فریشتەیەو نەشتێکی تر
﴿يأكل مما تأكلون منه﴾ لەوشتانەش دەخوا کە ئێوە لێیدەخۆن ﴿ويشرب مما تشربون﴾ و لەوشتانەش ئەخواتەوە
کە ئێوە لێیدەخۆنەوە، واتە:هەمووسیفەتەکانی, سیفەتی ئادەمزادن! ﴿٣٤ ولئن اطعتم بشرا مثلكم﴾ ئەگەرئێوە
بۆکەسێکی وەك خۆتان, ملکەچ و گوێرایەڵیی بکەن وقسەی لێ وەرگرن ﴿إنكم إذا لخاسرون﴾ بێگومان ئەوکات,ئێوە
زیانمەندانن, سەیرکە چەندە نەزان و کەوەدەنن، شوێنکەوتنی پەیامبەران بەزیانمەندی ئەدەنە قەڵەم، کەچی بت
پەرستن بەقازانج و سەرکەوتن دائەنێن؟! ﴿٣٥ أيعدكم انكم إذا متم وكنتم ترابا وعظاما﴾ ئایا هوود بەڵێن بە ئێوە
دەدا هەرکە مردن وبوونە گڵ وچەند ئێسکێك ﴿انكم مخرجون﴾ سەر لەنوێ زیندوو دەکرێنەوەو لەگۆڕ
دەردەهێنرێن! ﴿٣٦ هيهات هيهات لما توعدون﴾ هەی هۆ! هەی هۆ! لەو بەڵێنانە بە ئێوە ئەدرێن,گوایا پاش مردن
زیندوو بوونەوە ببێ، بەتایبەت پاش ڕزین و بوونە گڵ! ﴿٣٧ إن هي إلا حياتنا الدنيا﴾ ژیانمان هەر ئەم ژیانەی
دونیایە,جارێکی تر ژیانەوە نیە ﴿نموت ونحيا﴾ دەستەیەکمان ئەمرین و، دەستەیەکی تر لەدایك ئەبن و ئەژیێن،
ئیتر ژیانەوەیەکی تر نیە ﴿وما نحن بمبعوثين﴾ زیندووش ناکرێینەوە , واتە: زیندوو بوونەوە نیەدوای مردن ﴿٣٨
إن هو إلا رجل افترى على الله كذبا﴾ جا کەوایە باوەڕی پێ مەکەن، چونکە ئەو پیاوە,هەر پیاوێکە درۆ لەسەرخوا
هەڵدەبەستێ ﴿وما نحن له بمؤمنين﴾ خۆ ئێمەش هەرگیزباوەڕی پێناکەین ﴿٣٩ قال رب انصرني بما كذبون﴾ هوود
-دوای ئەوەی بەتەواوی لێیان مەیووس و بێزار بوو- وتی: ئەی پەروەردگاری من! دەسا یارمەتیم بدەو سەرم بخە
بەسەریانداو تۆڵەیان لێ وەرگرە لەبەرامبەر ئەوەوە کە ئەوان منیان بەدرۆزن دانا ﴿٤٠ قال عما قليل ليصبحن
نادمين﴾ خوا فەرمووی: کەمێکی ترو هەر بەم زوانە- لەوسەرپێچییان -پەشیمان دەبنەوە, ئەویش کاتی دیتنی
سزاکەیە ﴿٤١ فأخذتهم الصيحة بالحق﴾ ئەوسا بە هەق نارەتەو دەنگێکی زۆر بەهێز دایگرتن ودڵی بچڕاندن و
مێشکی تەقاندن ﴿فجعلناهم غثاء﴾ وکردماننە وەك پووش و پەڵاشی سەر ئاومان. ڕاڤەکەرانی قورئان ئەڵێن: جبریل
یەك نارەتەی بەهێزو توندی بەسەرا کردن، زەویی لەژێریانەوە کەوتە لەرزە لەرزو هەموویان بەدەما کەوتن و مردن
﴿فبعدا للقوم الظالمين﴾ دەبا دووری لەرەحمەتی خوا بۆگەلی ستەمکاربێ.

## چەند گەل و هۆزێکی تر:

﴿٤٢ ثم انشأنا من بعدهم قرونا آخرين﴾ لەدوای ئەوان چەندبەرەو گەلێکی ترمان- وەکو هۆزی صالح و، لووط
و، شوعەیب و.. هتد- هێنایە کایەوە, سەرەنجام ئەوانیش سەرپێچییان کردو, وەك ئەوان لەناومان بردن ﴿٤٣ ما
تسبق من أمة أجلها وما يستأخرون﴾ چونکە هەر نەتەوەو گەلێك کاتێ بڕیاری لەناو بردنی دەدرێت، ئیتر لە ئاکامی
حەتمیی خۆی نەپێش ئەکەوێ و، نە دوایش ئەکەوێ، واتە: بۆ لەناوبردنی هەمووکۆمەڵ و گەلێك کاتێکی دیاریی

هەیە، ئیتر لەو کاتەی خۆیە هیچ پاش و پێشێك ناکات ﴿[٤٤] ثم أرسلنا رسلنا تترا﴾ پاشان بۆ هەر گەلێ لەوانە، پەیامبەرانی خۆمانمان –یەك لەدوای یەك– ناردووە، وەك ئەم ئایەتەش دەفەرموێ: (ولقد بعثنا فی کل أمة رسولا أن اعبدوا الله واجتنبوا الطاغوت فمنهم من هدیالله ومنهم من حقت علیه الضلالة..)١٦/٣٦. ﴿کلما جاء أمة رسولها کذبوه﴾ هەرجارێ ئوممەت و گەلێکیان پێغەمبەری– لەخۆی بۆ هاتبا– زۆربەیان بڕوایان پێ نەکردون و بەدرۆزنیان دانان، وەك ئەفەرموێ: (یا حسرة علی العباد ما یأتیهم من رسول إلا کانوا به یستهزؤن)٣٦/٣٠. ﴿فأتبعنا بعضهم بعضا﴾ ئێمەش ئەوانەمان بەدوای یەکدا لەناو بردن بەهۆی لاساریانەوە ﴿وجعلناهم احادیث﴾ وکردیشماننە باس وخواسی سەرزاری خەڵکی، هەردەم بە داستان بۆیەکتریان ئەگێڕایەوە، وەك ئەفەرموێ: (فجعلناهم أحادیث ومزقناهم کل ممزق) ٣٤/١٩. ﴿فبعدا لقوم لا یؤمنون﴾ دەبا ئەوانەی باوەڕناهێنن هەر دووربن لە ڕەحمەت ومیهرەبانی خوای دلۆڤان.

کورتە باسێکی مووساو فیرعەون:

﴿[٤٥] ثم ارسلنا موسی واخاه هارون بایاتناوسلطان مبین﴾ لەپاشان موساو هاروونی برایمان ڕەوانەکردهاوڕێ بە نیشانەکانمان و بەڵگەیەکی ئاشکراو روونەوە ﴿[٤٦] إلی فرعون وملائه﴾ بۆلای فیرعەون وپیاوە سەرزل گەورەکانی هۆزەکەی ﴿فاستکبروا﴾ کەچی نکوڵی و تەکە بوریان کرد" لەبڕواهێنان " ﴿وکانوا قوما عالین﴾ چونکە کۆمەل و گەلێکی لووت بەرزو خۆبەزلزان بوون ﴿[٤٧] فقالوا انؤمن لبشرین مثلنا﴾ جافیرعەون و دارودەستەکەی گوتیان: جائایا دەبێ ئێمە بەدوو کەسی وەك خۆمان بڕوا بێنین " کەهیچیان لە ئێمە زیاتر نیە!!" ﴿وقومهما لنا عابدون﴾ لەکاتێکا هۆزو نەتەوە کەشیان بەگشتیی ملکەچ و خزمەتگوزارو کۆیلەی خۆمانن؟" ﴿[٤٨] فکذبوهما فکانوا من المهلکین﴾ ئینجا لەدوای ئەوهەموو کۆشش و هەوڵە هەر باوەڕیان پێ نەکردن و بەدرۆزنیان دانان و دەرەنجامیش یاخی بوون، چوونە ڕیزی تیاچووانەوە ﴿[٤٩] ولقد آتینا موسی الکتاب﴾ بێگومان لەدوای فەوتاندنی (فیرعەون) نامەی تەورات –کەپڕ بوو لە حوکم و بڕیار– بە موسامان بەخشی ﴿لعلهم یهتدون﴾ بەڵکو قەومەکەی ڕێدەرکەن و بەڕێی ڕاستدا بڕۆن ﴿[٥٠] وجعلنا ابن مریم وأمه آیة﴾ هەروەها کوڕەکەی مەریەم "عیسا" و دایکیمان کردنە نیشانەو بەڵگەیەکی گەورە لەسەر دەسەڵاتی خۆمان، چونکە عیسا بێ باوك لەدایك بوو، دایکیشی بێ ئەوەی مێرد بکات عیسای لێ بوو!! ﴿وآویناهما إلی ربوة ذات قرار ومعین﴾ و هەردووکمان لە گردوجێگایەکی بەرزی (بیت المقدس) حەوانەوەو نیشتەجێ کردن، کە شوێنی قەرارگرتن و حەوانەوەو،ئاوی لەبەر ڕۆیشتووی تێدابوو.

الجزء الثامن عشر — سورة المؤمنون

مَا تَسْبِقُ مِنْ أُمَّةٍ أَجَلَهَا وَمَا يَسْتَـْٔخِرُونَ ﴿٤٣﴾ ثُمَّ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا تَتْرَا
كُلَّ مَا جَاءَ أُمَّةً رَسُولُهَا كَذَّبُوهُ فَأَتْبَعْنَا بَعْضَهُم بَعْضًا وَجَعَلْنَاهُمْ
أَحَادِيثَ فَبُعْدًا لِقَوْمٍ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٤٤﴾ ثُمَّ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ وَأَخَاهُ
هَارُونَ بِآيَاتِنَا وَسُلْطَانٍ مُبِينٍ ﴿٤٥﴾ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَئِهِ
فَاسْتَكْبَرُوا وَكَانُوا قَوْمًا عَالِينَ ﴿٤٦﴾ فَقَالُوا أَنُؤْمِنُ لِبَشَرَيْنِ مِثْلِنَا
وَقَوْمُهُمَا لَنَا عَابِدُونَ ﴿٤٧﴾ فَكَذَّبُوهُمَا فَكَانُوا مِنَ الْمُهْلَكِينَ
﴿٤٨﴾ وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ ﴿٤٩﴾ وَجَعَلْنَا
ابْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُ آيَةً وَآوَيْنَاهُمَا إِلَىٰ رَبْوَةٍ ذَاتِ قَرَارٍ وَمَعِينٍ
﴿٥٠﴾ يَا أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُوا مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَاعْمَلُوا صَالِحًا إِنِّي بِمَا
تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴿٥١﴾ وَإِنَّ هَٰذِهِ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَأَنَا رَبُّكُمْ
فَاتَّقُونِ ﴿٥٢﴾ فَتَقَطَّعُوا أَمْرَهُم بَيْنَهُمْ زُبُرًا كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ
فَرِحُونَ ﴿٥٣﴾ فَذَرْهُمْ فِي غَمْرَتِهِمْ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿٥٤﴾ أَيَحْسَبُونَ أَنَّمَا
نُمِدُّهُم بِهِ مِن مَالٍ وَبَنِينَ ﴿٥٥﴾ نُسَارِعُ لَهُمْ فِي الْخَيْرَاتِ بَل لَا يَشْعُرُونَ
﴿٥٦﴾ إِنَّ الَّذِينَ هُم مِّنْ خَشْيَةِ رَبِّهِم مُّشْفِقُونَ ﴿٥٧﴾ وَالَّذِينَ هُم
بِآيَاتِ رَبِّهِمْ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٨﴾ وَالَّذِينَ هُم بِرَبِّهِمْ لَا يُشْرِكُونَ ﴿٥٩﴾

٣٤٥

## پاك خۆر بن و ئاكار چاك بن:

﴿٥١ يا أيها الرسل كلوا من الطيبات واعملوا صالحا﴾ وتمان: ئەی پەیامبەران! هەر لەخۆراكی پاك و حەڵاڵ بخۆن و، بەردەوام كاری چاك ئەنجام بدەن، واتە:پەیامبەرانمان گشت بەو جۆرە ڕێنمایی كردوون، كەواتە ئوممەت و گەلەكەیشیان دەبێ هەروا ڕەفتار بكەن ﴿إنی بما تعملون علیم﴾ بێگومان من زاناو ئاگادارم بەوكارو كردەوەیە ئێوە دەیكەن، دیارە ئەمە هەڕەشەیەكی گەورەیشە لە ئوممەت وگەلانی هەموو پەیامبەران (علیهم الصلاة والسلام) بۆیە هەریەكەیان هەوڵی زۆری داوە كە هەرلە ڕەنجەشانی خۆی نان بخوات، وەك ئەفەرموێ: ((مامن نبی إلا رَعی الغَنَمَ، قالوا: وأنتَ یارسولَ اللهِ؟ قال: نَعَمْ، كُنْتُ أرعاها علی قَراریطَ لأهل مكة)) هەموو پێغەمبەرێك شوانیی مەڕوپەزی كردووە، وتیان: مەگەر تۆش ئەی پێغەمبەری خوا! فەرمووی: بەڵێ منیش، لەبەرامبەر شەش یەكی درەمێكەوە (مەڕم بەخێودەكرد) بۆخەڵكانی مەككە. أخرجه البخاری فی كتاب الاجاره ١٤٤/٤). وە هەروا فەرموویەتی: ((إن داود ﷺ كان یأكل من كسب یده)) أخرجه البخاری كتاب البیوع ٣٠٣/٤، واتە: بێگومانە داوود پێغەمبەر هەمیشە لە كرد و كۆششی دەستی خۆی نانی دەخوارد! ﴿٥٢ وإن هذه أمتكم أمة واحدة﴾ وە بەڕاستیی هەر ئەمەشە ئایین و بەرنامەی تاك و تەنهای ئێوە ئەی پەیامبەران كەهەر یەك ئایین و یەك بەرنامەیە بۆ بانگ كردنی خەڵكی بۆ پەرستنی یەك تاكەخوا، هەرچەند لەهەندێ ئەحكامی فەرعیدا جۆرە جیاوازییەك هەبێت، بەڵام لەعەقیدەو ئایدۆلۆژیدا هەموویان یەكن ﴿وأنا ربكم فاتقون﴾ ومن پەروەردگاری ئێوەم، جا كەوایە هۆشیار بن, لەسەرپێچی و، نافەرمانی من خۆبپارێزن ﴿٥٣ فتقطعوا أمرهم بینهم زبرا﴾ كەچی لەپاتی یەكگرتن و یەكڕیزبوون لەناوخۆیاندا, كارو فەرمانیئایینەكەیان بچڕ بچڕ كرد و بوونە چەند گروپ و دەستەیەكەوە، هەر گروپەش ڕێگاو ڕێبازێكی بۆ خۆی هەڵبژارد! ﴿كل حزب بما لدیهم فرحون﴾ هەموودەستەو گروپێك بەو بەرنامەیەی لایانە خۆشحاڵ و دڵخۆشن، بۆیە بەهەڕەشەوە ئەفەرموێ: ﴿٥٤ فذرهم فیغمرتهم حتی حین﴾ ئەی پێغەمبەر!وازیان لێ بێنە با تاماوەیەك لە زەلكاوی نەفامی و غەفڵەتی خۆیاندا قەتیس بمێنن، ئەوجا ئەوكاتە چاك ئەزانن چییان پێدەكەم ﴿٥٥ أیحسبون أنما نمدهم به من مال وبنین﴾ ئاخۆ ئەوان پێیان وایە كە بەو ماڵ و منداڵە پێیان دەبەخشین ﴿نسارع لهم فی الخیرات﴾ دەمانەوێ بەپەلە لەونیعمەتانە بەهرەوەریان بكەین؟ ﴿بل لا یشعرون﴾ نەخێر, ئەوانە تێناگەن، ئەگینا ماڵ و منداڵ نیشانەی چاكی و ڕێز لێنان نیە, بەڵكو بۆ تاقیكردنەوەیە.

## خێرخوازان بناسە:

جا دوای ڕیسوا كردنی ئەوانەی بوونەتە چەند دەستەو تاقمێك، دێتە سەر وەسفی ئەوانەی كە بەڕاستی شیاوی ماڵ و منداڵ پێدانن ویەكڕیزیشن, وەك ئەفەرموێ: ﴿٥٧ إن الذین هم من خشیة ربهم مشفقون﴾ بێگومان ئەوكەسانەی كە هەمیشە لە بەرپەروەردگاریان دڵیان دەترسێ ﴿٥٨ والذین هم بآیات ربهم یؤمنون﴾ ئەوانەش كە بەگشت بەڵگەكانی پەروەردگاریان باوەڕ دەكەن ﴿٥٩ والذین هم بربهم لا یشركون﴾ ئەوانەش كە هەرگیزهاوبەش بۆ پەروەردگاریان دانانێن ﴿٦٠ والذین یؤتون ماآتوا﴾ و ئەوانەش وا هەقە ببەخشن لەوماڵەی خوا پێیداون, دەبەخشن ﴿وقلوبهم وجلة﴾ كەچی هێشتا دڵیان دەلەرزێ ﴿أنهم إلی ربهم راجعون﴾ لەگەڕانەوەیان بۆلای پەروەردگاریان،واتە: ئەترسن لەو ڕۆژەدا كارەكانیان باتڵ و پووچەڵ بێت ﴿٦١ أولئك یسارعون فی الخیرات﴾ ئەوانەی ئەو وەسفانەیان تێدایە، كەسانێكن لە ئەنجامدانی كارە چاكەكاندا – لەبەر ڕەزامەندی خوا – هەمیشە بە تالووكەن و پەلەئەكەن ﴿وهم لها سابقون﴾ وەبۆ ئەنجامدانی كارەچاكەكان , لە خەڵكی تر لە پێشترن.

**دادوەریی خواو بێباری موشریکان:**

﴿[٦٢] ولا نكلف نفسا إلا وسعها﴾ ئەرکێ بەپێی توانا نەبێ نایخەینە سەر کەس ﴿ولدينا كتاب ينطق بالحق﴾ دۆسیەو نامەی هەمووکە سێکمان بۆ تۆمارکردنی کردەوەکانیان لایە کە بە راست و هەقگۆیانە قسە ئەکات, هەر بە پێی ئەوەش تۆڵەو پاداش ئەدرێنەوە ﴿وهم لا يظلمون﴾ وە هیچ جۆرە ستەمێکیشیان لێناکرێ ﴿[٦٣] بل قلوبهم فى غمرة من هذا﴾ بەڵکو بێ باوەڕانی قورەیش لەمە دڵیان خافڵ و بێ ئاگایە و سەریان دەرناچێ و تێناگەن ﴿ولهم اعمال من دون ذلك﴾ وە بێجگە لەوەش چەند کارو کردەوەیەکی ناپەسەندونابەجێیان هەیە ﴿هم لها عاملون﴾ کە هەمیشە ئەنجامی ئەدەن ﴿[٦٤] حتى إذا اخذنا مترفيهم بالعذاب﴾ تا ئەوکاتەی کە خەڵکە خۆشگوزەرانەکانیان دوچاورو گرفتار ئەکەین بە سزای دوا ڕۆژی قیامەت, لە دنیاشدا گەلێجار دووچار دەبن ﴿إذا هم يجأرون﴾ ئیتر ئەوکاتە لەپڕ نەعرەو هاواریان لێ بەرز ئەبێتەوە، وەك هاواری وەحشیی بیابانەکان، وەك خوا لەجێیەکی‌تردا هەڕشەدەکا و ئەفەرموێ: (وذرنى والمكذبين أولى النعمة و مهلهم قليلا) ١١/٧٣. یان دەفەرموێ: (كم أهلكنا من قبلهم من قرن فنادوا ولات حين مناص) ٣/٣٨.﴿[٦٥] لا تجأروا اليوم﴾ لەقیامەتدا پێیان ئەڵێن: ئەمڕۆ ئیتر ئێوە بەهیچ جۆرێ هاوار مەکەن ﴿إنكم منالا تنصرون﴾ چونکە بێگومان ئێوە لە لایەن ئێمەوە کۆمەکی ناکرێن ﴿[٦٦] قد كانت آياتى تتلى عليكم﴾ چونکە بەراستیی ئەوکاتەی ئایەتەکانی ئێمەتان بەسەردا ئەخوێنرانەوە ﴿فكنتم على اعقابكم تنكصون﴾ ئێوە هەمووتان پاشەو پاش ئەکشانە وە، وەك خواخۆی لەجێیەکی تردا ئەفەرموێ: (ذلكم بانه إذا دعى الله وحده كفرتم و إن يشرك به تؤمنوا فالحكم لله العلى الكبير). ﴿[٦٧] مستكبرين به﴾ لە بەرامبەریاندا خۆتان زۆر بە زل ئەزانی ﴿سامرا تهجرون﴾ بێجگە لەوەش بە درێژایی شەوو شەوگاریش لەدەوری کابەدا دادەنیشتن و سەبارەت بە قورئان و بەپەیامبەر ﷺ هەرقسەی خراپ و نابەجێتان ئەکرد ﴿[٦٨] أفلم يدبروا القول﴾ ئاخۆ ئەوان تێنەفکران لەم گوفتارە, واتە: لەقورئان , تا بەو هۆیەوە بزانن کتێبێکی مۆعجیزەو لە لای خواوەندیانەوەیە؟ ﴿أم جاءهم مالم يأت آباءهم الأولين﴾ یان ئەو بانگەوازەی پێغەمبەرەی هاتووە بۆلایان, نامۆیە بە بانگەوازەکانی پێغەمبەرانی پێشوو,کە باپیرانیان پێیان گەیشتوون؟ واتە:ئەو بانگەوازەش موحەممەد (پێغەمبەر)هاتووە پێی, هەر لە جۆرو چەشنی بانگەوازی پێغەمبەرانی پێشووە, کە بەباپیرانیان نامۆنەبووە ﴿[٦٩] ام لم يعرفوا رسولهم فهم له منكرون﴾ یاخود ئەوەیەکە پەیامبەرەکەی خۆیان نەناسی بوو کە چەندە بەرەوشت و ڕاستگۆو کردار شیرین بووە، بۆیە ئاوا دژی دەوستن و نکوڵی ئەکەن؟ خۆ ئەوەش وانییە، چونکە چاك ئەیناسن، کە چ ڕەوشت بەرزێکە ﴿[٧٠] ام يقولون به جنة﴾ یاخود ئەڵێن شێتەو جن دەستی

الجزء الثامن عشر — سورة المؤمنون

وَالَّذِينَ يُؤْتُونَ مَا آتَوا وَّقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ أَنَّهُمْ إِلَىٰ رَبِّهِمْ رَاجِعُونَ ﴿٦٠﴾
أُولَٰئِكَ يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَهُمْ لَهَا سَابِقُونَ ﴿٦١﴾ وَلَا نُكَلِّفُ
نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا وَلَدَيْنَا كِتَابٌ يَنطِقُ بِالْحَقِّ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٦٢﴾
بَلْ قُلُوبُهُمْ فِي غَمْرَةٍ مِّنْ هَٰذَا وَلَهُمْ أَعْمَالٌ مِّن دُونِ ذَٰلِكَ هُمْ لَهَا
عَامِلُونَ ﴿٦٣﴾ حَتَّىٰ إِذَا أَخَذْنَا مُتْرَفِيهِم بِالْعَذَابِ إِذَا هُمْ يَجْأَرُونَ
﴿٦٤﴾ لَا تَجْأَرُوا الْيَوْمَ إِنَّكُم مِّنَّا لَا تُنصَرُونَ ﴿٦٥﴾ قَدْ كَانَتْ آيَاتِي
تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فَكُنتُمْ عَلَىٰ أَعْقَابِكُمْ تَنكِصُونَ ﴿٦٦﴾ مُسْتَكْبِرِينَ
بِهِ سَامِرًا تَهْجُرُونَ ﴿٦٧﴾ أَفَلَمْ يَدَّبَّرُوا الْقَوْلَ أَمْ جَاءَهُم مَّا لَمْ يَأْتِ
آبَاءَهُمُ الْأَوَّلِينَ ﴿٦٨﴾ أَمْ لَمْ يَعْرِفُوا رَسُولَهُمْ فَهُمْ لَهُ مُنكِرُونَ
﴿٦٩﴾ أَمْ يَقُولُونَ بِهِ جِنَّةٌ بَلْ جَاءَهُم بِالْحَقِّ وَأَكْثَرُهُمْ لِلْحَقِّ
كَارِهُونَ ﴿٧٠﴾ وَلَوِ اتَّبَعَ الْحَقُّ أَهْوَاءَهُمْ لَفَسَدَتِ السَّمَاوَاتُ
وَالْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ بَلْ أَتَيْنَاهُم بِذِكْرِهِمْ فَهُمْ عَن
ذِكْرِهِم مُّعْرِضُونَ ﴿٧١﴾ أَمْ تَسْأَلُهُمْ خَرْجًا فَخَرَاجُ رَبِّكَ خَيْرٌ
وَهُوَ خَيْرُ الرَّازِقِينَ ﴿٧٢﴾ وَإِنَّكَ لَتَدْعُوهُمْ إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٧٣﴾
وَإِنَّ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ عَنِ الصِّرَاطِ لَنَاكِبُونَ ﴿٧٤﴾

٣٤٦ — وَلَوْ رَحِمْنَٰهُمْ

لێوەشاندووە؟! ﴿بل جاءهم بالحق﴾ نا, هەرگیز وانیە، بەڵکو ئەو بە ئایینێکی هەق و ڕاستیی بۆلای ئەوان هاتووە ﴿وأكثرهم للحق كارهون﴾ بەڵام زۆربەیان هەقیان پێناخۆشەو, سەخڵەتن پێی ﴿٧١ ولو اتبع الحق أهواءهم﴾ ئەگەر هەق و ڕاستیی خوا دوای هەواو ئارەزووی ئەوان کەوتبا، چۆنیان پێخۆشبا, هەق ئاوا بووبا ﴿لفسدت السموات والأرض ومن فيهن﴾ بێگومان ئێستا سیستەمی ئاسمانەکان و زەوی و هەر دروستکراوێکیتریش تیایاندایە, دەشێواو تێکدەچوو ,چونکە بوونەوەر لەسەر بناغەی دادپەروەریی و دادگەریی دامەزراوە، نەك بەئارەزووی ئەوان بێت، چونکە هەندێ شت هەرچەند ناهەقی و ستەمیش بێت هەربەلای ئەوانەوە حەقە! وەك خوا ئەفەرموێ: (لوكان فيهما آلهة إلا الله لفسدتا) ٢١/٢٢. ﴿بل أتيناهم بذكرهم﴾ لەحاڵێکدا ئێمە قورئانێکمان پێدان کە بەهەق ئامۆژگارییان دەکا ﴿فهم عن ذكرهم معرضون﴾ کەچی ئەوان لەوە ڕوو وەردەگێڕن ﴿٧٢ أم تسألهم خرجا﴾ یان لە بەرامبەر ئەوەوە کە تۆ ئیسلامیان بۆباسدەکەیت، داوای مزەو هەزینەیەکیان لێدەکەیت، تائەوانیش بڕوا نەهێنن؟! ﴿فخراج ربك خير﴾ خۆئەوەش نەبووە، چونکە کرێ و مزەی پەروەردگارت لە هەمووشتێك چاکترە، وەکو خوا خۆی لەسوورەتێکی تردا ئەفەرموێ: (قل ما سألتكم من أجر فهو لكم إن أجری إلا علی الله) ٣٤/٤٧. یان وەك ئەفەرموێ: (قل ما أسألكم عليه من أجر وما أنا من المتكلفين) ٣٨/٨٦. ﴿وهو خيرالرازقين﴾ وەئەویش باشترینی ڕۆزیدەرانە ﴿٧٣ وإنك لتدعوهم إلى صراط مستقيم﴾ وە بێگومان تۆبانگیان هەربۆ ڕێگاو ڕێبازی ڕاست و دروست دەکەیت ,کە ئایینی پیرۆزی ئیسلامە، کەواتە ئەوپەیامبەرە زۆر شایستەیە کە ئێوە دوای بکەون ﴿٧٤ وإن الذين لا يؤمنون بالآخرة﴾ ئەوانەش کە باوەڕ بە ڕۆژەکەیتر(ئاخیرەت) ناهێنن ﴿عن الصراط لناكبون﴾ ئەوە لەڕێگاو ڕێبازی ڕاست لادەدەن، ئەگینا چۆن ئابەو شێوەیە ئەتوانن ملە ملێ بکەن؟ ﴿٧٥ ولو رحمناهم وكشفنا ما بهم من ضر﴾ خۆ ئەگەر لەگەڵ ململانێکردنیاندا ڕەحمان پێکردبان و ئەوناڕەحەتی وبەڵایەشمان لەسەر لابردبان، واتە: گرانی و بێ بارانیمان لەسەر لادابان ﴿للجوا في طغيانهم يعمهون﴾ هەربە سەرگەردانی لە سەرکەشی خۆیان ملیان دەناو دەمانەوە ﴿٧٦ ولقد أخذناهم بالعذاب﴾ بەڕاستیی بەسزای جۆراوجۆریش قارمان لێگرتن,واتە: (بەڵاو گرانی و قات و قڕییمان بەسەرریاندا) ﴿فما استكانوا لربهم﴾ کەچی لەگەڵ ئەوەشدا بەرامبەربە پەروەردگاریان نە ملکەچ بوون و ﴿وما يتضرعون﴾ نەکرووزانەوە,بۆ لابردنی سزاکە، بەڵکو هەر درێژەیان بە خراپەو خراپەکاری خۆیاندا، ئەگینە خوا وەڵامی ئەدانەوە ﴿٧٧ حتى إذا فتحنا عليهم بابا ذا عذاب شديد﴾ تا کاتێ کە دەرگای سزایەکی توندو قورسیان لێدەکەینەوە ﴿إذاهم فيه مبلسون﴾ ئیتر هەموو تێیدا نائومێد دەبن، واتە: بە چەند جۆرەسزایەك تاقیمانکردنەوە، کەچی هەر کەڵکی نەبوو، تاسەرەنجام دووچاری سزای سەختی قیامەت دەبن، ئیتر لە هەموو دەرگایەکی خێرو

الجزء الثامن عشر — سورة المؤمنون

۞ وَلَوْ رَحِمْنَاهُمْ وَكَشَفْنَا مَا بِهِم مِّن ضُرٍّ لَّلَجُّوا فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ (٧٥) وَلَقَدْ أَخَذْنَاهُم بِالْعَذَابِ فَمَا اسْتَكَانُوا لِرَبِّهِمْ وَمَا يَتَضَرَّعُونَ (٧٦) حَتَّىٰ إِذَا فَتَحْنَا عَلَيْهِم بَابًا ذَا عَذَابٍ شَدِيدٍ إِذَا هُمْ فِيهِ مُبْلِسُونَ (٧٧) وَهُوَ الَّذِي أَنشَأَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ ۚ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ (٧٨) وَهُوَ الَّذِي ذَرَأَكُمْ فِي الْأَرْضِ وَإِلَيْهِ تُحْشَرُونَ (٧٩) وَهُوَ الَّذِي يُحْيِي وَيُمِيتُ وَلَهُ اخْتِلَافُ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ (٨٠) بَلْ قَالُوا مِثْلَ مَا قَالَ الْأَوَّلُونَ (٨١) قَالُوا أَإِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَامًا أَإِنَّا لَمَبْعُوثُونَ (٨٢) لَقَدْ وُعِدْنَا نَحْنُ وَآبَاؤُنَا هَٰذَا مِن قَبْلُ إِنْ هَٰذَا إِلَّا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ (٨٣) قُل لِّمَنِ الْأَرْضُ وَمَن فِيهَا إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ (٨٤) سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ۚ قُلْ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ (٨٥) قُلْ مَن رَّبُّ السَّمَاوَاتِ السَّبْعِ وَرَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ (٨٦) سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ۚ قُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ (٨٧) قُلْ مَن بِيَدِهِ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ يُجِيرُ وَلَا يُجَارُ عَلَيْهِ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ (٨٨) سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ۚ قُلْ فَأَنَّىٰ تُسْحَرُونَ (٨٩)

٣٤٧

چاكه بێ هیواو ناهومێد دەبن. له (بوخاریی) و (موسلیم)دا هاتووه: كاتێ كه قورەیش نافەرمانی و، سەرپێچییان لەپێغەمەركرد ﷺ، نزای شەڕی لێكردن و فەرمووی: ((اللهم أَعِنِّی علیهم بِسَبْعٍ كَسَبْعِ یُوسُفَ)) خوایە! بە حەوت ساڵی وشكە ساڵ(واتە:حەوت ساڵیبێبارانی وگرانی) وەك حەوت ساڵەكەی (یووسف) یارمەتیم بدەو سەرمخەبەسەریاندا, جاپاش دووچار بوونیان لەخواپاڕانەوە، بەڵام چونكە راستبێژ نەبوون، خوا وەڵامی نەدانەوەو نەهات بەهانایانەوە.﴿٧٨ وهو الذی أنشأ لكم السمع والأبصار والأفئدة﴾ هەرئەوزاتەیە كە هێزی بیستن و بینین وئامێری ئاوەزو دڵیپێدان، تا بەهەر یەك لەوانە لە بوونەوەر,باشتر تێبگەن و ورد ببنەوەودڵیان بدەنێ و، سەرئەنجام گوێرایەڵی خوا بن ﴿قلیلا ما تشكرون﴾ كەچی ئێوە لە چاوئەو گش نیعمەتانەدا زۆر كەم سوپاس وشوكرانە بژێریی دەكەن! ﴿٧٩ وهو الذی ذرأكم فی الأرض﴾ هەر ئەویشە ئێوەی وەك تۆو لەم زەوییەدا بڵاوە پێكرد ﴿وإلیه تحشرون﴾ وەهەرلای ئەویش كۆدەكرێنەوە، بۆ حیساب و پاداش و تۆڵە، پاش پەراگەندەییتان ﴿٨٠ وهو الذی یحیی ویمیت﴾ هەر ئەویشە ژین دەبەخشێ و، مردوان زیندوو دەكاتەوەو، زیندوانیش ئەمرێنێ ﴿وله اختلاف اللیل والنهار﴾ جیاوازی شەوو ڕۆژ،ئاڵ و گۆڕو، زیاد و كەمكردنیان و بەدوا یەكهاتنیان، هەر بۆئەوە, نەك كەسێكی تر ﴿افلا تعقلون﴾ دەی هەر تێناگەن و ژیریتان ناخەنەگەڕ؟ناڵێن زاتێك خاوەنی ئەو هەموو دەسەڵاتە بێ، ئەی چۆن لێنایەت سەر لەنوێ مردوان زیندوو بكاتەوە؟! ﴿بل قالوا مثل ماقال الأولون﴾ نەخێر، ژیرنابن و تێناگەن، بەڵكوئەمانیش هەر ئەوە دەڵێن كە پێشینانیان گوتیان ﴿٨٢ قالوا: إذا متنا وكنا ترابا وعظاما﴾گوتیان: باشە! هەركە مردین و بووینە گڵ و ئێسكە ڕزیو ﴿إنا لمبعوثون﴾ ئاخۆ بۆجارێكیتر زیندوو دەكرێینەوە؟!دیارەئەوان شتیوا زۆر بەنەگونجاو دوور دەزانن ﴿٨٣ لقد وعدنا نحن وآباؤنا هذا من قبل﴾ خۆ بێسۆئەم بەڵێنی زیندوو بوونەوەیە، هەم بەخۆمان و،هەم بە باپیرانیشمان -پێش هاتنی موحەممەد ﷺ -پێدرا ﴿إن هذا إلا أساطیر الأولین﴾ ئێمە دڵنیاین كەئەم قسانە گش پڕو پاڵانتەو هەڵبەستراوی پێشینانە،لەوە بەولاوە شتێكیتر نیە،خواش لەسەر زمانی ئەوان، لەچەند سوورەتێكی ترد ئەفەرموێ: (إذا كنا عظاما نخرة قالوا تلك إذا كرة خاسرة) ٧٩/١١-١٢. یان دەفەرموێ: (وضرب لنا مثلا ونسی خلقه...) ٧٨/٣٦.

**موشریكیش ددان بە (ربووبییەت)دا دەنێ:**

﴿٨٤ قل لمن الأرض ومن فیها﴾ پێیان بڵێ: ئەی موحەمەد! ﷺ باشە! زەویی و گشت ئەوانەی لەزەوییدان ودەژین هی كێیە؟ "كێ دروستی كردوون و، لە نەبوونەوەهێناونی خانەی بووەكانەوە؟ ﴿إن كنتم تعلمون﴾ ئەگەر ئێوە ئەزانن، ئادەی پێم بڵێن،دیارەچاریان نیە هەر دەبێ راستیەكان بسەلمێنن، بۆیە لەوەڵامدا ﴿٨٥ سیقولون لله﴾ دەڵێن: ئەوانە هەموو موڵك وتایبەتمەندی خوان ﴿قل أفلا تذكرون﴾ پێیان بڵێ: جا كە ئاوایە، ئەی بۆ بیر ناكەنەوە، تا بزانن زاتێك دەسەڵاتی ئاوای هەبێ، هەر هەمان دەسەڵاتیشی دەبێ بۆزیندوو كردنەوە ﴿٨٦ قل من رب السموات السبع ورب العرش العظیم﴾ پێیان بڵێ: ئەی كێ پەروەردگاری حەوت ئاسمانەكانە؟ ئەیكێ پەروەردگاری (عەرش)ی مەزن و گەورەیە؟ لەكۆتایی سوورەتەكەددەفەرموێ: (..رب العرش الكریم) ﴿٨٧ سیقولون لله﴾ دیسان گش دەڵێن: هەر خوایە پەروەردگارو بەدیهێنەریان ﴿قل أفلا تتقون﴾ پێیان بڵێ: باشە! ئیتر بۆ لەخوا ناترسن، تا هاوبەش و هاوەڵی بۆ دانەنێن؟ ﴿٨٨ قل من بیده ملكوت كل شئ﴾ پێیان بڵێ: ئەی دەسەڵاتی گش بوونەوەر بەدەست كێیە ﴿وهو یجیر ولا یجار علیه﴾ وكە ئەو پەنای پەناخواز دەدا و، دژی ئەو پەنا نادرێت ﴿إن كنتم تعلمون﴾ ئەگەر ئەزانن كێیە؟ ئادەی پێم بڵێن. ﴿٨٩ سیقولون لله﴾ دیسان دەڵێن: هەر بۆ خوایە ﴿قل فأنی تسحرون﴾ پێیان بڵێ: دەسائەی

چۆن فریو دەخۆن و چاوتان لە ئاستی ڕاستییەکان بەستراوە؟! ﴿٩٠ بل اتیناهم بالحق﴾ بەڵکو ئێمە ڕاستیی و هەقمان بۆیان هێنا، ﴿وإنهم لکاذبون﴾ ئەوان درۆزنن کەدەڵێن: خوا منداڵ و هاوبەشی هەیە.

**خوا شەریکی نییە :**

خوای گەورە لەم ئایەتانەدا حاشادەکا لەدانانی شەریك وهاوبەش بۆی، وەکو دەفەرموێ:﴿٩١ ما اتخذ الله من ولد﴾ خوا هەرگیز منداڵی بۆ خۆی هەڵنەبژاردووە، جا ئەوکەی پێویستی بە منداڵ هەیە,تامنداڵ بۆخۆی بگرێت؟ ﴿وما کان معه من إله﴾ و هیچ پەرستراوێکیشی نەکردووە بەشەریك بۆخۆی، هەر خۆیەو تاك و تەنیایە ﴿إذا لذهب کل إله بما خلق﴾ خۆ ئەگەر هاوبەشی بووبا – وەك ئەوان پێیان وایە – ئەودەمە هەریەك لەو خوایانە دەچووبەلای دروستکراوی خۆیەوە، بۆ خۆی سەپەرشتی دەکردو ئەوسا یاسای بوونەوەر تێك دەچووو،وەکو ئێستا نەدەما ﴿ولعلا بعضهم علی بعض﴾ وهەندێکی زاڵ دەبووبەسەر هەندێکدا،وەك پاشاکانی دنیا، جا کەئێستا هیچ شتێکی وا نابینرێ، مانای وایە هەر خوایەکی تاك و تەنیاهەیە ﴿سبحان الله عما یصفون﴾ خواتاك و تەنیایە،بێخەوشە بێگەردە،لە ئەوشتانەی ئەوان وەسفی خوای پێدەکەن و، دەڵێن هاوەڵ و منداڵیهەیە ﴿٩٢ عالم الغیب والشهادة﴾ لە گش نهێنی و نادیار، ئاشکراو دیار،زاناو بەئاگایە ﴿فتعالی عما یشرکون﴾ جا کەوابوو خوا بەرزەو،لە سەرووی ئەو شتانەوەیە موشریکان دەیانکەنە شەریك و هاوبەش وهاوتای.

**فەرماندان بە پێغەمبەر، بە پاڕانەوە بەرلەهاتنی سزا :**

خوای کاردروست فەرمان بە پێغەمبەر دەداکە لەکاتی بەلاو نارەحەتییدا بپاڕێتەوەودۆعابکات: وەکو دەفەرموێ:﴿٩٣ قل رب إما ترینی ما یوعدون﴾ بڵێ: ئەی پەروەردگاری من! ئەر هەر دەبێ بڕێ لەو سزایەم نیشان بدەیت کە هەڕەشەی پێدەکەیت لەوخوانەناسانە،واتە:ئەرسزاتدان و،منیش لەژیندابووم ﴿٩٤ رب فلا تجعلنی فی القوم الظالمین﴾ پەروەردگارەکەم! مەمخەرە ڕیزیخەڵکانی ستەمکارەوە، لەفەرموودەیەکدا هاتووەو دەفەرموێ: ((وإذا أردتَ بقومٍ فتنةً،فَتوَفّنی إلیكَ غَیرَ مَفْتُونٍ)) پێشەوا(ئەحمەد،ترمزیی). ﴿٩٥ وإنا علی أن نریك ما نعدهم لقادرون﴾ وخۆ بەڕاستیی ئێمە دەتوانین ئەو سزاو تۆڵەیەی ئەوانەت نیشان بدەین کە بەڵێنمان پێداون، بەڵام لەبەر هەر بڕیارو حیکمەتێك بێت کەخۆمان ئەیزانین ئەنجامیئەو هەڕەشەیە دوا ئەخەین بۆ ڕۆژی بەرێ، هەتا بەڵکو مناڵەکانیان باش ببن.

الجزء الثامن عشر | سورة المؤمنون

بَلْ أَتَيْنَٰهُم بِٱلْحَقِّ وَإِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴿٩٠﴾ مَا ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ مِن وَلَدٍ
وَمَا كَانَ مَعَهُۥ مِنْ إِلَٰهٍ ۚ إِذًا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَٰهٍۭ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلَا
بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٩١﴾ عَٰلِمِ
ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٩٢﴾ قُل رَّبِّ
إِمَّا تُرِيَنِّى مَا يُوعَدُونَ ﴿٩٣﴾ رَبِّ فَلَا تَجْعَلْنِى فِى ٱلْقَوْمِ
ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٩٤﴾ وَإِنَّا عَلَىٰٓ أَن نُّرِيَكَ مَا نَعِدُهُمْ لَقَٰدِرُونَ ﴿٩٥﴾
ٱدْفَعْ بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ٱلسَّيِّئَةَ ۚ نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَصِفُونَ ﴿٩٦﴾
وَقُل رَّبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ هَمَزَٰتِ ٱلشَّيَٰطِينِ ﴿٩٧﴾ وَأَعُوذُ بِكَ
رَبِّ أَن يَحْضُرُونِ ﴿٩٨﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَهُمُ ٱلْمَوْتُ قَالَ رَبِّ
ٱرْجِعُونِ ﴿٩٩﴾ لَعَلِّىٓ أَعْمَلُ صَٰلِحًا فِيمَا تَرَكْتُ ۚ كَلَّآ ۚ إِنَّهَا كَلِمَةٌ
هُوَ قَآئِلُهَا ۖ وَمِن وَرَآئِهِم بَرْزَخٌ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٠٠﴾ فَإِذَا نُفِخَ
فِى ٱلصُّورِ فَلَآ أَنسَابَ بَيْنَهُمْ يَوْمَئِذٍ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ ﴿١٠١﴾
فَمَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٢﴾ وَمَنْ
خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ فِى جَهَنَّمَ
خَٰلِدُونَ ﴿١٠٣﴾ تَلْفَحُ وُجُوهَهُمُ ٱلنَّارُ وَهُمْ فِيهَا كَٰلِحُونَ ﴿١٠٤﴾

ألم تكن | ٣٤٨

ئینجا بۆ تێکەڵیکردنی مەردم بە شێوازێکی خواپەسەندانە خوای کارڕەوان دەفەرموێ: ﴿[٩٦] ادفع بالتی
هیأحسن السیئة﴾ هەمیشه ئەی پێغەمبەر!هەوڵ بدە لە گەڵیاندا بەجوانترین و چاکترین شێوە پاڵ بەخراپەوە بنێ.
واتە: هەردەم بەکرداری جوان وشیرین لەگەڵ بتپەرستەکانی هۆزەکەتدا، رەفتار بکەو چاوپۆشییان لێ بکە، لە
سوورەتێکی تردا هاتووەو دەفەرموێ: (إدفع بالتی هی أحسن فإذا الذی بینك وبینه عداوة كأنه ولی حمیم.
ومایلقیها إلا الذین صبروا..). ﴿نحن أعلم بما یصفون﴾ ئێمە باشتر ئەزانین بەوەی ئەوان دەیڵێن و وەسفی تۆی
پێدەکەن, دەرەنجامیش پاداشتیانی لەسەر دەدەینەوە، جا کەوایە تۆ بێ تاقەت مەبە لێیان، بەڵێ چاکە کردن لەگەڵ
خراپکاراندا بەلای نەفسەوە شتێکی زۆر قورسەو، شەیتان صەد گرفتی بۆدروست دەکات، بۆیە خوا بەپێغەمبەر
ئەفەرموێ: ﴿[٩٧] وقل رب أعوذ بك من همزات الشیاطین﴾ بڵێ پەروەردگاری من! پەنا بەتۆ ئەگرم لەتێکوتاندن و
دنەدنەو وەسوەسەی شەیتانەکان "کە بەرەو کاری خراپ بمبەن و نەهێڵن لەبەرامبەری خراپەوە چاکە بکەم ﴿[٩٨]
وأعوذ بك رب أن یحضرون﴾ وخۆشم هەر بەتۆ ئەسپێرم ئەی پەروەردگارم! کە ئەوان بێنە لامەوە بۆ تێکدانی
کارەکانم. (وەلیدی کوڕی وەلید) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا! گەڵێ جار هەست بەتەنیایی و بێ تاقەتیی ئەکەم،
ئەویش فەرمووی: ((إذا أخَذْتَ مَضْجِعَكَ فقل: أعوذ بكلمات الله التامة مِنْ غَضَبِهِ وعِقابِهِ وشَرِّ عِبادِهِ، ومن هَمَزاتِ
الشیاطینِ وأن یحضرون)) کاتێ چوویتە سەرجێگەکەت بۆخەو ئەم دوعایە بخوێنە، ئیتر بێگومان هەرگیز ئەوانە
لێت نزیك نابنەوەو، ناشتوانن هیچ جۆرە زیانێکت پێ بگەیەنن.

**حاڵی کافران لە سەرە مەرگدا:**

حاڵی بەدحاڵی حاشاکەرانی دینی ئیسلام لەگیانەڵلاّ دا، لەم چەن ئایەتانەدا رادەگەیەنێ و، دەفەرموێ: ﴿[٩٩]
حتی إذا جاء أحدهم الموت﴾ خوانەناسان هەر درێژە بەکاری خراپ و بێ بڕوایی خۆیان ئەدەن تا کاتێ مردن
یەخەی یەکە بەیەکەیان دەگرێت و ئەحواڵی ئاخیرەتی بۆ ئاشکرا دەبێ ﴿قال رب ارجعون﴾ ئەوسا ئەڵێ:
پەروەردگارم! بمگێڕەوە بۆ دنیا ﴿[١٠٠] لعلی أعمل صالحا فیما ترکت﴾ بەشکو ئەوکارەچاکەی کاتیخۆی لەدەستم
چووە بیکەم ﴿کلا إنها کلمة هو قائلها﴾ نەخێر! هەرگیز ئەو داخوازیە جێبەجێ نابێت، ئەوەیش هەر قسەیەو- ئەو
بەناچاری- دەیکات ﴿ومن ورائهم برزخ إلی یوم یبعثون﴾ وەتارۆژێ زیندوو دەکرێنەوە لەمپەرێکی زۆر گەورەیان
لەپێشدایەو ناتوانن بگەڕێنەوە بۆ دنیا، واتە: هەرگیز ناگەڕێنەوەو هەر لەسزاشدا دەبن.(تەفسیری ئیبن
کەسیر)دەڵێ: (قال مجاهد: البرزخ: الحاجز مابین الدنیا والآخرة. وقال محمد بن كعب: البرزخ: ما بین الدنیا والآخرة،
لیسوا مع أهل الدنیا یأكلون ویشربون، ولا مع أهل الآخرة یجازون بأعمالهم. وقال أبو صخر: البرزخ: المقابر، لاهم فی
الدنیا ولا هم فی الآخرة، فهم مقیمون إلی یوم یبعثون). واتە: پاش مردن حاڵەتی (بەرزەخ)یان دێ، ئەویش نەوەك
حاڵەتی قیامەتە , تا پاداش و تۆڵە وەرگرن، نەوەك باری دنیاشە، تا خۆراك و ئیسراحەتی هەبێ.

**کاروکردەوەی مرۆڤ کێشانە دەکرێ:**

﴿[١٠١] فإذا نفخ فی الصور﴾ ئینجا کاتێ لە جاری دووەمدا، فوکرا بەشەیپوردا، بۆ زیندوو بوونەوە ﴿فلا أنساب
بینهم یومئذ﴾ ئیتر لەبەر قورسیی و نارەحەتیی ئەو رۆژەیە، هیچ نەسەب و خزمایەتییەك لەنێوانیاندا
ناخوێنرێتەوە, چونکە هەرکەسەی سەرقاڵ و سەرگەرمە بەکاری خۆیەوەو، پەردەژی نییە، تا ئاوەڕ بەلای
خزمەکەیەوە بداتەوە، تەنها کردەوەی چاك و بڕوای چاك کەڵکی دەبێ بۆی ﴿ولا یتساءلون﴾ و لەیەکتریش ناپرسن،
چونکە هەریەکە کاری خۆی هەیە، بەو شێوەیە کە خوا دەفەرموێ: (یوم یفر المرء من أخیه، وأمه وأبیه)٣٥/٣٤/٨٠.

﴿١٠٢ فمن ثقلت موازينه﴾ ئینجا ئەوکەسەی تای تەرازووی کێشانەی کردەوەکانی قورس و سەنگین بێ ﴿فأولئك هم المفلحون﴾ ئەوە ئەوانەن سەرفرازو ڕزگاردەبن ﴿١٠٣ ومن خفت موازينه﴾ هەر کەسێکیش تەرازووی چاکەی سووك بێ، واتە خراپەکانی لەچاکەکانی زیاتر بێت. ﴿فأولئك الذين خسروا أنفسهم﴾ ئەمانە ئەو کەسانەن زیانیان بەخۆیان گەیاندووە و گومڕاو بەدبەختبوون و خۆیانیان لەکیس چووە ﴿في جهنم خالدون﴾ بەهەتا هەتاییش لەدۆزەخدا ئەمێننەوەو هەرگیز ڕزگاریان نابێت ﴿١٠٤ تلفح وجوههم النار﴾ شۆڵەو بڵێسەی ئاگر چڕو چاویان دەبرژێنێ و ﴿وهم فيها كالحون﴾ ولێوەکانیشیان هەڵدەچرچێ. لەفەرموودەیەکیشدا هاتووە: (تَشْوِيهِ النارُ فتَتَقَلّصُ شَفَتُهُ العُلْيا حتى تَبْلُغَ وَسَطَ راسِهِ، وتَسْتَرْخِي شفتُهُ السُّفْلَى حتى تَضْرِبَ سُرَّتَهُ)) رواه أحمد والترمذي وقال: حسن غريب. واتە: ئاگر ڕوومەتیان دەبرژێنێ و، لێوەکانی سەروویان هەڵدەقرچێ و، ئەرەوێتەوە بۆ تەوقەسەریان و، لێوی خوارەوەیشیان بەردەبێتەوە تا دەگاتە ناوکیان!

**دۆزەخییەکان ددان بە بەدبەختی خۆیاندا دەنێن:**

خوا لەدوای ئەو سزا قورس و سەختەی ڕۆژی قیامەتەیان، سەرکۆنەو سەرزەنشتیان دەکاو دەفەرموێ:﴿١٠٥ الم تكن آياتي تتلى عليكم﴾ ئایا کاتی خۆی لەدنیادا ئایەتەکانی ئێمەتان بە سەردا نەدەخوێنرایەوە؟ ﴿فكنتم بها تكذبون﴾ کەچی لەگەڵ ئاشکراو ڕوونیشیاندا ئێوە هەر بڕواتان پێ نەکردن؟ ئەوجا وائەزانن ئەگەر پێ لێ بنێن بەو کارەیان ڕزگار دەبن و بەهرەمەند ئەبن، بۆیە: ﴿١٠٦ قالوا ربنا غلبت علينا شقوتنا﴾ بەکەساسیەکەوە دەڵێن: پەروەردگارمان! نەگبەتی و بەدبەختی بەسەرماندا زاڵ بوو ﴿وكنا قوما ضالين﴾ وگەلێکی گومڕاو سەرلێشێواو بووین ﴿١٠٧ ربنا اخرجنا منها﴾ پەروەردگارمان! لەو ئاگرە دەرمانکەو بۆ دنیامان وەگێڕە ﴿فإن عدنا فإنا ظالمون﴾ ئەنجا ئەگەر ئەمجارەش گەڕاینەوە بۆ بێ بڕوایی، بەڕاستیی ئێمە کەسانێکی ستەمکارین، لەوە ئەچێ پرسیارەکەی سەرەوە هەر بۆ خەم و خەفەتخواردن بێت، نەك بۆ وەڵام و تووێژ، بۆیە ﴿١٠٨ قال اخسئوا فيها ولا تكلمون﴾ خوا دەفەرموێ: دوورکەونەوەو قسەم لەگەڵ مەکەن ﴿١٠٩ إنه كان فريق من عبادي يقولون﴾ کاتێ دەستەیەك لەبەندەکانم ئەیانوت: ﴿ربنا آمنا فاغفر لنا﴾ پەروەردگارمان! ئێمە بڕوای دامەزراومان بەتۆ هێنا، جا تۆیش لێمان خۆش ببە ﴿وارحمنا وانت خير الراحمين﴾ وەبەزەییت پیامانا بێتەوە، چونکە تۆ چاکترین زاتێکی کە لەهەموو میهرەبانێك میهرەبانتری، دەڵێن: ئەو تاقمە ئەوە داوایانە (بیلال و صوهەیب و خەبباب و..) بوون، کە (ئەبوجەهل) گاڵتەی پێ دەکردن. بەڵام تا ڕۆژی قیامەتیش هەر موسڵمانێك گاڵتەی پێ بکرێ هەر وایە ﴿١١٠ فاتخذتموهم سخريا﴾ ئێوە کردتانن بەمەسخەرەی خۆتان ﴿حتى انسوكم ذكرى﴾ هەتاخەریکبوونتان بیگاڵتە پێکردنیانەوە،ناوی منیان لەبیر بردنەوە ﴿وكنتم منهم تضحكون﴾ وبەردەوام بەوان



أَلَمْ تَكُنْ ءَايَٰتِي تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فَكُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴿١٠٥﴾ قَالُوا۟ رَبَّنَا غَلَبَتْ عَلَيْنَا شِقْوَتُنَا وَكُنَّا قَوْمًا ضَآلِّينَ ﴿١٠٦﴾ رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا مِنْهَا فَإِنْ عُدْنَا فَإِنَّا ظَٰلِمُونَ ﴿١٠٧﴾ قَالَ ٱخْسَـُٔوا۟ فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ ﴿١٠٨﴾ إِنَّهُۥ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْ عِبَادِى يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغْفِرْ لَنَا وَٱرْحَمْنَا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿١٠٩﴾ فَٱتَّخَذْتُمُوهُمْ سِخْرِيًّا حَتَّىٰٓ أَنسَوْكُمْ ذِكْرِى وَكُنتُم مِّنْهُمْ تَضْحَكُونَ ﴿١١٠﴾ إِنِّى جَزَيْتُهُمُ ٱلْيَوْمَ بِمَا صَبَرُوٓا۟ أَنَّهُمْ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴿١١١﴾ قَٰلَ كَمْ لَبِثْتُمْ فِى ٱلْأَرْضِ عَدَدَ سِنِينَ ﴿١١٢﴾ قَالُوا۟ لَبِثْنَا يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ فَسْـَٔلِ ٱلْعَآدِّينَ ﴿١١٣﴾ قَٰلَ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا ۖ لَّوْ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١١٤﴾ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَٰكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلْمَلِكُ ٱلْحَقُّ ۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْكَرِيمِ ﴿١١٦﴾ وَمَن يَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ لَا بُرْهَٰنَ لَهُۥ بِهِۦ فَإِنَّمَا حِسَابُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿١١٧﴾ وَقُل رَّبِّ ٱغْفِرْ وَٱرْحَمْ وَأَنتَ خَيْرُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿١١٨﴾

ترتيبها ٢٤ — سُورَةُ النُّورِ — آياتها ٦٤

٣٤٩

پێدەکەنین ﴿(١١١) إنی جزیتهم الیوم بما صبروا﴾ جا با بزانن ئەمڕۆ منیش - لەم ڕۆژە سەختەدا- پاداشتم دانەوە بەهۆی ئارام و خۆگرتنیانەوە ﴿انهم هم الفائزون﴾ کە تەنها ئەوانن سەربەرزو بەختیار.جا لەدوای ئەو ریسوایی و سەر شۆڕییەیان هەندێ پرسیاری تریان لێ ئەکرێ: ﴿(١١٢) قال کم لبثتم فی الأرض عدد سنین﴾ ئەوسا خوای گەورە ئەفەرموێ: ئەرێ چەند ساڵ لەزەویدا مانەوە، واتووشی ئەو خەجاڵەتییە بوون وئێستاش داوای گەڕانەوە ئەکەن؟ ﴿(١١٣) قالوا لبثنا یوما أو بعض یوم﴾ جا لەبەر سەختیی ڕۆژەکە دەڵێن: ئێمە هەر ڕۆژێك، یا کەمتر لەڕۆژێك ماینەوە ﴿فسئل العادین﴾ جا لەحیسابگران بپرسە، چونکە ئێمە لەبەر سزای خۆمان هیچمان لەبیر نەماوە ﴿(١١٤) قال إن لبثتم إلا قلیلا﴾ خوا ئەفەرموێ: لەڕاستییدا ئێوە زۆر کەمماونەتەوە لەچاو ڕۆژەکانی قیامەتدا، هەرچەندە بوو بێت ﴿لو انکم کنتم تعلمون﴾ خۆ ئەگەر ئێوە سەرەنجامی کوفرو تاوان و ئەندازەی ماوەی مانەوەتان لەدنیادا زانیبا، باوەڕتان دەهێناو گوێڕایەڵیتان دەکرد،هەتا ئەمڕۆ ئاوا گیرۆدەبن. ئینجا بۆ سەرزەنشت و سەرداخستنیان ئەفەرموێ: ﴿(١١٥) افحسبتم انما خلقناکم عبثا﴾ ئایا پێتان وابوو بە گەمەو بێ هودە دروستمان کردوون ﴿وانکم إلینا لا ترجعون﴾ وقەتیش بۆلای ئێمە ناهێنرێنەوە بۆ تۆڵەو پاداش؟! ﴿(١١٦) فتعالی الله الملك الحق﴾ مەزنایەتیو بەرزی و بڵندی هەر بۆ خوای پاشاو فەرمانڕەوای هەقە، زۆر لەوەش بەرزترە کە ئەوان گاڵتەی پێ بکەن، هەر ئەوە پاشا، هەر ئەوە ڕاست و دروستبێژ, هەرچی شتە بەدەستی ئەوە ﴿لا إله إلا هو﴾ هیچ پەرستراوێکی هەق جگە لەو زاتە نیە ﴿رب العرش الکریم﴾ ئەر خۆی خاوەنیعەرشی بەدیکۆرە.

**خوانەناس ڕزگاری نابێ:**

خوا هەڕەشە لەو کەسانە دەکا، شەریك وهاوتای بۆدادەنێن، بۆیە دەفەرموێ:﴿(١١٧) ومن یدع مع الله إلها آخر﴾ ئەوەی لە گەڵ خوادا هانا بۆ خوایەکی تر دەبات و، دەیپەرستێ ﴿لا برهان له به﴾ هیچ بەڵگەیەکیش نیە لە سەر شیاوی بۆ پەرستنایە تی﴿فإنما حسابه عند ربه﴾ ئەوە هەر پرسینەوەی کارو کردەوەکانی لای پەروەردگاریەتی,وەنایگەیەنێت بە بەختیاری, چونکە کافرو بێباوەڕە ﴿إنه لا یفلح الکافرون﴾ دەیخۆ بێباوەڕەکان هەرگیز بەختیارو ڕزگار نابن، بەڵکو تەنها بڕواداران پیرۆزو بەختیار ئەبن، وەك لەسەرەتای سوورەتەکەدا فەرمووی: (قد افلح المؤمنون..) لێرەشدا فەرمووی: (إنه لایفلح الکافرون). ﴿(١١٨) وقل رب اغفر وارحم﴾دەسا ئەی موحەممەدﷺ ڕووبکەرە خواو بڵێ: ئەی پەروەردگاری من! بمبەخشە و، بەزەییت پێمدا بێتەوە ﴿وانت خیر الراحمین﴾ چونکە هەرئەتۆی چاکترینی بە بەزەییان.

ئێمەش لەکۆتاییدا ئەڵێین: (اللهم اغفر لنا وارحمنا برحمتك التی وسعت کل شئ یا أرحم الراحمین، اللهم آمین).

زۆریش شوکرانە بژێرم بۆ خوا، لەبەرامبەر تەواو کردنی تەفسیری ئەم سوورەتەی (موئمینون)ـە.

*** *** ***

## ٢٤- سوورەتی ( نوور )ـە
## مەدەنییەو ( ٦٤ ) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتەش گرنگییەکی تەواو دەدات بەلایەنی بڕیارو ئەحکام، ئاڕاستە، ڕەوش، هەندێ کاروباری تری گشتیی، تایبەتیی، بۆ ئەوەی موسڵمانان بە (تاك و كۆمەڵ)ـەوە لەسەری پەروەردە بكرێ، جگە لەوەیش چەندین ئاڕاستەی تایبەت بەخێزانەوەی تێدایە. ئەم سوورەتە ئاداب و نەریتی كۆمەڵایەتی ڕۆشن دەكاتەوە، چ بۆ كارو باری تاكی كەسێتی، چ بۆ گشتیی، وەك مۆڵەت وەرگرتن بۆ هاتوچۆو ڕۆیشتنە ماڵی یەكتر، چاو گرتنەوە لە ئاستی نامەحرەم، پاراستنی عەورەت لە جێی حەرام.. یاساغ كردنی تێكەڵیی نێوان ژن و پیاوی نامەحرەم، ئینجا ئەو بنەمایانەش كە دەبێ بونیادی خێزانی موسڵمان و، ماڵی موسڵمانی لەسەر بینا بكرێ، وەك ڕاگرتنی دەست پاكیی و داوێن پاكیی، پاك و خاوێنی و" خۆداپۆشین و كپ كردنەوەی هێزی ڕابواردن و،پێ هەڵخلیسكاندن و قایم و مەحكەم پێ داگرتن لەسەر شەریعەتی خوا، دوور كەوتنەوە لەو شتانە كۆمەڵ و كۆمەڵگە دەڕوخێنن.

**لەم سوورەتەدا:** هەندێ لە تۆڵەی شكاندنی سنوورە شەرعییەكان باس دەكرێ " وەك: زیناو شەرواڵ پیسیی، بوختان كردن (قذف). نەفرین كردنی ژن و پیاو لە یەكتر (ملاعنة)... دیارە گشت ئەم یاسایانە بۆ پاراستنی كۆمەڵگە دەبێ لە فەسادو خراپەو پشێوی و تێكەڵبوونی ڕشتەو نەژادو دابەزینی ڕەوشتی پیرۆز.

**لەم سوورەتەدا** گەورەترین لایەنی كۆمەڵگە (خێزان) لە هەر مەترسییەك ڕووی تێ بكات و بەرەو ڕووخان بیبات دەپارێزرێ، ئیتر لەو لایشەوە هەڵنانی مرۆ بۆ ڕەوشتی بەرزو قەشەنگ با بوەستێ.

الجزء الثامن عشر　　　سورة النور

بسم الله الرحمن الرحيم
سورة أنزلناها وفرضناها وأنزلنا فيها آيات بينات لعلكم تذكرون
(١) الزانية والزاني فاجلدوا كل واحد منهما مائة جلدة ولا تأخذكم
بهما رأفة في دين الله إن كنتم تؤمنون بالله واليوم الآخر وليشهد
عذابهما طائفة من المؤمنين (٢) الزاني لا ينكح إلا زانية أو
مشركة والزانية لا ينكحها إلا زان أو مشرك وحرم ذلك على
المؤمنين (٣) والذين يرمون المحصنات ثم لم يأتوا بأربعة شهداء
فاجلدوهم ثمانين جلدة ولا تقبلوا لهم شهادة أبدا وأولئك هم
الفاسقون (٤) إلا الذين تابوا من بعد ذلك وأصلحوا فإن الله غفور
رحيم (٥) والذين يرمون أزواجهم ولم يكن لهم شهداء إلا أنفسهم
فشهادة أحدهم أربع شهادات بالله إنه لمن الصادقين (٦)
والخامسة أن لعنت الله عليه إن كان من الكاذبين (٧) ويدرؤا
عنها العذاب أن تشهد أربع شهادات بالله إنه لمن الكاذبين
(٨) والخامسة أن غضب الله عليها إن كان من الصادقين (٩)
ولولا فضل الله عليكم ورحمته وأن الله تواب حكيم (١٠)

إن الذين　　　٣٥٠

**بەكورتیی:** ئەم سوورەتی (نوور)ـە بەتەنیاخۆی بەسە بۆ هەر خێزانێك بیەوێ بە سەربەرزی بژی و، ژیانی سەربڵندانە بەسەر ببا، بۆیە پێشەوا عومەر خوا لێی ڕازی بێ بۆخەڵكی كوفەی نووسی: (علموا نساءكم سورة النور)، ژنەكانتان ئەی ئیمانداران فێری سورەتی (نور) بكەن. بەم شێوەیەش دەست پێ ئەكات: ﴿**بسم الله الرحمن الرحيم** * [1]**سورة انزلناها**﴾ ئەمە سورەتێكی زۆرگرنگی قورئانە و، "پڕە لەچەندین یاسای قەشەنگ، ئێمە بۆ تۆمان نار دۆتە خوارەوە ئەی پێغەمبەر ﷺ " (وفرضناها) وە گەلێ فەرمان و یاسامان تێیدا بڕیار داوە ﴿**وانزلنا فيها آيات بينات**﴾ وە چەندان ئایەتی ئاشكراو ڕوونی" تەشریع" ییمان تێیدا ناردووەتە خوارەوە جا كەواتە ئەم سوورەتە هەر

بۆ خوێندنەوە نیيە، بەڵكو بۆ یاساو بەرنامە و كارپێكردنیشە ﴿لعلكم تذكرون﴾ تا بەڵكو بیربكەنەوەو ئامۆژگاری پێ وەرگرن و، بەپێی ئایەتەكانی هەریەكەی ئەم سوورەتە رەفتار بكەن، بەڵێ پاش ئەوە" ئەم سوورەتە بەوشێوەیە دەرگای لە خۆی كردەوە.

**زینا كەرانی ( مێرو ژن ) هەریەك سەد تازیانەیان لێدەن:**

ئینجا دێتە سەر باسی تاكەتاكەی یاساكان، وەلە سنووروو حوكمی زیناكەرانەوە دەست پێ ئەكات: ﴿ الزانية والزاني فاجلدوا كل واحد منهما مائة جلدة﴾ ئەو كچ و كوڕەی زیناو شەرواڵ پیسیی ئەكەن، دەبێ لە هەریەكەیان سەد جەڵدە "شەلاق"ی لێ بدەن. ئەمە تۆڵەی هەر كەسێكە (نێر، یان مێ) پێشتر بە شێوەی شەرعیی جووت نەبووبێ (واتە: كچ وكوڕ) بن، بەڵام ئەو كەسانەی كە بەیەك گەیشتبن " لە نیكاحێكی سەحیحدا " وە ئازادو، ژیربن، پێگەیشت و(باڵغ) بن، موسوڵمان بن، ئینجا زینا بكەن، ئەوە دەبێت بەردەباران بكرێن ﴿ولا تأخذكم بهما رأفة في دين الله﴾ نابێ بەزەیی و نەرم و نیانیی و سۆز بتانگرێ لەبەرامبەر هەریەك لەو دوانەوە لە ڕاپەراندنی حوكمی خوادا، واتە: لەكاتی جێ بە جێ كردنی بڕیاری خوادا، توندوتیژبن وبەزەییتان بە زیناكەراندا نەیەتەوە، بەوشێوەیە ژمارەی شەلاقەكان، یا بەردە بارانەكە، وەكو خۆی جێ بە جێ نەكەن ﴿إن كنتم تؤمنون بالله واليوم الآخر﴾ ئەگەر ئێوە باوەڕتان بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە ﴿وليشهد عذابهما طائفة من المؤمنين﴾ جا بۆ ئەوەی ئەودوانەپتر ئێشیان پێ بگات و، خەڵكیش پەند وەرگرن، باكۆمەڵێ لە بڕواداران ئامادەی سزاكەیان بن و ببینن "دیارە ئەو.خەڵكە ئامادەبووە تازۆرتر بێت چاكترە، هەرچەندە بەئامادەبوونی چوار كەسیش جێ بە جێ ئەبێ، ئینجا بۆ پتر قیزەون كردنی زیناو، سووك كردنی زیناكاران ئەفەرموێ: ﴿ الزاني لا ينكح إلا زانية أو مشركة﴾ پیاوی زیناكەرو شەرواڵ پیس هەردەبێ ژنی زیناكەروداوێن تەڕ،وە یان موشریك و بتپەرست مارە بكات بۆخۆی، چونكە ئافرەتی شەریفەو داوێن پاك هەرگیز هاوشانی ئەو نیيە، كەواتە زیناكەران لە كۆڕی بڕواداران ئەچنە دەرەوە" ﴿والزانية لا ينكحها إلا زان أو مشرك﴾ ژنی زیناكار و داوێن تەڕیش، وە پیاوی زیناكارو،موشریكیش هەروا ئەبێ ﴿وحرم ذلك على المؤمنين﴾ بێگومانە ئەوجۆرە شووكردنە و" " مارەكردنەی ژنانی زیناكاران" لەسەر بڕوادارانی داوێن پاك حەرامكراوە. چونكە زیانی گەورەی تێدایە، قورئانیش ئەیەوێ لە نێوان موسڵمانان و ئەو تاقمەدا گشت پەیوەندیەك بپچرێنێ.

**روونكردنەوەیەك:** ئیمامی (ئیبن كەسیر) ئەڵێ: ئەم ئایەتەی: (الزاني لا ينكح الا زانية او مشركة..) یە وەكو ئایەتی (٢٥/ ٤): (محصنات غير مسافحات ولا متخذات أخدان) هەروا وەكوئایەتی: (٥/٥): (محصنين غير مسافحين ولا متخذي اخدان..) وایە. واتە: تابكرێ پیاو" ژنی داوێن پاك مارەبكات، ژنیش تابۆی دەست بدا شوو بە پیاوی داوێن پاك بكاو، دووریش بێت لەدۆست گرتن وداوێن پیسیی، بەڵام ئیمامی ئەحمەد- خوالێی خۆش بێت- لە وئایەتەوە ئەڵێت: ژنی زیناكار تا تەوبە نەكا، پیاوی داوێن پاك نابێ مارەی بكا، ئەگینە مارەی نایەت، وە هەروەها ژنی داوێن پاكیش نابێ شوو بە پیاوی داوێن پیس بكا، تا ئەویش تەوبەیەكی ڕەوان و دروست نەكا، جا ئەمەیە مانای ﴿وحرم ذلك على المؤمنين﴾. وەلە (سننی ئەبی داود /كتاب النكاح) ٢٢١/٢ لە (ئەبی هورەیرە)وە هاتووە: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((لا ينكح الزاني المجلود الا مثله)) پیاوی زیناكەری شەلاق لێدراو، هەردەبێ ژنێكی قامچی لێدراوی وەكو خۆی مارە بكات، نابێ ژنێكی تر بێنێت. بەڵام (ئەبووعەبدول قاسم)لە كتێبی (الناسخ

والمنسوخ) دا ئەڵێ: ئەو ئایەتەی: ﴿وحرم ذلك على المؤمنين﴾ بەئایەتی (وأنكحوا الأيامى منكم) نەسخ بۆتەوە، وە هەر ئیمامی (شافعی)یش دانی بەوەدا ناوە ودەشڵێت: ئەوئایەتە سڕاوەتەوە.

**بوختان کردن بۆ ژنانی داوێن پاك:**

ئینجا بۆزیاتر پاراستنی نامووس و شەرەفی موسڵمانان بەگشتیی" خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿[4] والذين يرمون المحصنات﴾ ئەو کەسانەش کە ژنانی داوێن پاك (یا پیاوانی داوێن پاك) تۆمەت بار ئەکەن بە زیناوە ﴿ثم لم يأتوا بأربعة شهداء﴾ پاشانیش چوار شایەت ناهێنن بۆ چەسپاندنی داواکەیان ﴿فاجلدوهم ثمانين جلدة﴾ دەبێ ئەوانە هەشتا شەلاقیان لێ بدەن تاجارێکیتر بە ناهەق و ناڕەوا نامووسی خەڵك لەکەدارو بریندار نەکەن ﴿ولا تقبلوا لهم شهادة أبدا﴾ هەتا هەتاشە نابێ شایەتیشیان بۆ شتی تر لێ وەرگرن" ﴿وأولئك هم الفاسقون﴾ ئا ئەوانەن لە سنوور دەر چووان" ولای خوا بە فاسق ئەدرێنە قەڵەم " ﴿[5] إلا الذين تابوا من بعد ذلك وأصلحوا﴾ مەگەر ئەوانەی دوای ئەو کارە دزێوو ناشیرینە پەشیمان دەبنەوەو کردەوەکانیشیان چاك دەکەنەوەو، جارێکیتریش ناگەڕێنەوە بۆ ئەوکارە ﴿فإن الله غفور رحيم﴾ ئەوە بێگومانە خوا بۆ ئەوجۆرەکەسانە زۆر لێبوردەیە، زۆریش میهرەبانە. " زانایان کێشەیان لەوەدا هەیە: ئایا ئەو ئیستیسنایەی- إلا الذين تابوا..- کویێ بڕیارەکان ئەگرێتەوە؟ جا هەریەکە یان لەوبارەوە قسەیەك ئەکات، هەندێکیان ئەڵێن: هەر سێ بڕیارەکەی لە کوڵ ناکەوێ: (شەلاق)، وە هەمیشەش هەر فاسقەو نابێ بە شایەت، مەگەر پەشیمان ببێتەوەو لەناو خەڵکیشا بڵێ: بەڕاستیی فلان -کە من بوختانم بۆ کرد- کەسێکی پاکە، بۆ ئەوەی بە تەواوی شوێنەواری ئەو بوهتانە نەمێنێ لەناو مەردومدا، لەولاشەوە ئابڕووی ئەو خێزانە بگەڕێتەوە. بەڵێ تا ئێستا باسی پاراستنی شەرەفی موسڵمانان بوو بەگشتیی.ئێستاش باسی ئەوکەسانە ئەکات هاوسەرو ژنی خۆیان بە زیناو شەروالْ پیسیی تاوانبار ئەکەن: ﴿[6] والذين يرمون أزواجهم﴾ ئەو کەسانەش کە تۆمەتی زینا و شەروالْ پیسیی دەدەنە پاڵ هاوسەرانیان ﴿ولم يكن لهم شهداء إلا أنفسهم﴾ لەهەمان کاتدا بێجگە لە خۆیان شایەتی تریان نییە شایەتییان بۆ بدەن کە ئەو ژنە زینای کردووە"چونکە چوار شایەت پێویستە بۆ ئیسپاتی زینا﴿فشهادة أحدهم أربع شهادات بالله﴾ جا بۆ ئەوەی ئەو هەشتا شەلاقەی لە کوڵ بکەوێ - ئەگەر شایەد نەبوو- ئەبێ هەریەك لەو جۆرە پیاوانە چوار جار بە ناوی خواوە شایەتی بدات و سوێند بخوات بەخوا ﴿إنه لمن الصادقين﴾ بڵێت: بە راستیی من لەراستگۆیانم "کە ئەڵێم ئەم ژنەم زینای کردووە" وە بەچاویخۆم تاوانەکە یم بینیوە ﴿[7] والخامسة أن لعنة الله عليه إن كان من الكاذبين﴾ پێنجەم جاریش بڵێت: نەفرینی خوام لەسەر بێت ئەگەر لە درۆزنانیش بم "بە کورتیی: هەر کات کابرایەك لە ژنەکەی خۆی خانەگومان کەوت و تۆمەتباری کرد بەزینا، ئەبێ بیبات بۆ لای دادوەری ئیسلام، ئەوجا دادوەریش چوار ئەشهەدو بیللای پێ بکێشێ کە لەوقسانەدا راست ئەکات، جا بۆ جاری پێنجەم نەفرین لە خۆی بکات، ئەگەر بوختان بکاو درۆ بکات، جا ئەگەر ژنەکە بێدەنگبوو بەردەباران دەکرێت.ئینجا ئەوکاتە بەلای ئیمامی شافیعی وزۆرێکی ترلەزانایانەوە ئەو ژنەی بەهەتا هەتایی لێ حەرام ئەبێت و، دەبێ مارەییەکەشی بەتەواوی بداتێ، لە پاشان ژنەکە بەردەباران ئەکرێ و، پیاوەکەش رزگاری ئەبێ" بەڵام لەگەڵ ئەویشدا خوایدلۆڤان دەرفەتیشی بۆ ژنەکە هێشتووتەوە، کە پاش سوێندی ئەوپیاوە دەتوانێ دیفاع لە خۆی بکات، وەك ئەفەرموێ: ﴿[8] ويدرأ عنها العذاب﴾ سزا لەسەر ئافرەتە "قەزف کراوەکەش "لائەبرێت و" سزانادرێ" ﴿أن تشهد أربع شهادات بالله﴾ کە ئەویش چوار جار شایەتی بداو" سوێند بە خوا بخوات و ئەشهەدوبیللا بکێشێ ﴿إنه لمن الكاذبين﴾ کە مێردەکەی لە درۆزنانەو، "درۆش ئەکات زینای داوەتە پاڵم " ﴿[9] والخامسة أن غضب الله

عليها﴾ و بۆ جاری پێنجەمین ژنەکە بڵێت: خەشم و قینی خوام لەسەر بێت ﴿إن كان من الصادقين﴾ ئەگەر ئەو مێردەم لە راستگۆیان بێت ومنیش زینام کردبێت وە لە دوای ئەمە دادوەری ئیسلام لێکیان جیا دەکاتەوەو بۆ هەتا هەتایی لێك حەرام دەبن لە وتەی ئیمامی شافعی و زۆرترینی زانایاندا وە ژنەکە هەموو مارەیەکەشی دەکەوێ. ﴿[10] ولو لا فضل الله عليكم ورحمته وان الله تواب رحيم﴾ خۆ ئەگەر فەزڵ و میهرەبانیی و رەحمی خوا نەبووبا لەسەرتان، وئەوەش نەبوایە کە خوا زۆر تەوبە وەرگرە ولە کارزان و کار جوانیشە ئێوە تووشی نارەحەتیی ئەبوون و، زۆربەی کاروبارتان لا قورس دەبوو. (ئیبن کەسیر) ئەڵێت: ئەم دە ئایەتەی خوارەوە: (إن الذين جاؤا بالإفك..) سەبارەت بە دایکی موسڵمانان (خاتوو عائیشە رضی الله عنها) هاتوونەتە خوارەوە، ئەو کاتە دووروەکان نەخشەی



إِنَّ الَّذِينَ جَاءُو بِالْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْ لَا تَحْسَبُوهُ شَرًّا لَّكُم بَلْ هُوَ
خَيْرٌ لَّكُمْ لِكُلِّ امْرِئٍ مِّنْهُم مَّا اكْتَسَبَ مِنَ الْإِثْمِ وَالَّذِي تَوَلَّىٰ
كِبْرَهُ مِنْهُمْ لَهُ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١١﴾ لَّوْلَا إِذْ سَمِعْتُمُوهُ ظَنَّ الْمُؤْمِنُونَ
وَالْمُؤْمِنَاتُ بِأَنفُسِهِمْ خَيْرًا وَقَالُوا هَٰذَا إِفْكٌ مُّبِينٌ ﴿١٢﴾ لَّوْلَا
جَاءُو عَلَيْهِ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَإِذْ لَمْ يَأْتُوا بِالشُّهَدَاءِ فَأُولَٰئِكَ
عِندَ اللَّهِ هُمُ الْكَاذِبُونَ ﴿١٣﴾ وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ
فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ لَمَسَّكُمْ فِي مَا أَفَضْتُمْ فِيهِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٤﴾
إِذْ تَلَقَّوْنَهُ بِأَلْسِنَتِكُمْ وَتَقُولُونَ بِأَفْوَاهِكُم مَّا لَيْسَ لَكُم بِهِ عِلْمٌ
وَتَحْسَبُونَهُ هَيِّنًا وَهُوَ عِندَ اللَّهِ عَظِيمٌ ﴿١٥﴾ وَلَوْلَا إِذْ سَمِعْتُمُوهُ
قُلْتُم مَّا يَكُونُ لَنَا أَن نَّتَكَلَّمَ بِهَٰذَا سُبْحَانَكَ هَٰذَا بُهْتَانٌ عَظِيمٌ
﴿١٦﴾ يَعِظُكُمُ اللَّهُ أَن تَعُودُوا لِمِثْلِهِ أَبَدًا إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧﴾
وَيُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمُ الْآيَاتِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١٨﴾ إِنَّ الَّذِينَ
يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ الْفَاحِشَةُ فِي الَّذِينَ آمَنُوا لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ
فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿١٩﴾ وَلَوْلَا
فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ وَأَنَّ اللَّهَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٠﴾



بۆهتانێکی گەورەیان بۆ کێشا: جا خوای گەورەیش جل جلاله ئەوکارەی بەلاوە شتێکی زۆر قورس و نارەحەت بوو.

**بوختان بۆ خاتوو عائیشە ( خوا لێی رازی بێ ):**

ئەوجا بۆ دیفاع و بەرگری لە نامووس و شەرەفی پەیامبەر ﷺ لەسەریەك دە ئایەت ئەنێرێ و ئەفەرموێ: ﴿[11] إن الذين جاؤا بالإفك عصبة منكم﴾ بێگومان ئەوانەی کە ئەو درۆو بوختانە گەورەیان هەڵبەست، کۆمەڵێك بوون لە خۆتان" ﴿لا تحسبوه شرا لكم﴾ وا مەزانن ئەو رووداوە بۆ ئێوە شەرو خراپە ﴿بل هو خير لكم﴾ بەڵکو چاك وخێرە بۆتان ئێوە "بەویاسایە لەئاییندەدا نامووسی ملیۆنەها موسڵمان ئەپارێزرێ و" بەرگری لێ ئەکرێ... کەوابوو زۆر چاکە بۆتان، چونکە لەلایەکەوە دوژمنایەتی بێ بڕواکانتان بۆ دەرکەوت" کە تاچ ئەندازەیەك ئەیانەوێ ئابڕووی ئەو بنەماڵەو خێزانە پاکانە بەرن، شەرەفی ئەو بنەماڵانە بشکێنن.. چاکە بۆتان، چونکە خوای گەورە بەدوای یەکدا(١٠) ئایەت دەنێرێ بۆ دیفاع لە نامووسی داوێن پاکان "﴿لكل امرئ منهم ما اكتسب من الإثم﴾ بێگومان هەریەکەش لەوانە چەند لەو گوناهو تاوانە بەشدارە" بەشێك تاوانی تایبەتی لە ئەستۆی خۆیدایە" واتە: هەرکەسە چەندە کۆششی بۆ کردبێ بە ئەندازەی ئەوەش تۆڵە وەرئەگرێ" ﴿والذي تولى كبره منهم﴾ ئەو کەسەش کە سەرۆکایەتی بەشێکی زۆری ئەو تاوانەیەی کرد (کوڕەکەی سەلول) ﴿له عذاب عظيم﴾ سزایەکی سەخت وگەورەی بۆ هەیە چونکە هەر ئەوکاتە (صەفوان) وشترەکەی لێ ئەخوڕی و، خاتوو عائیشەش لەناو کەژاوەکەدا بوو، کوڕەکەی سەلوول لەناو خەڵکێکی زۆردا وەستابوو و پرسی ئەمە کێیە؟! وتیان: عائیشەی خێزانی پەیامبەرە ﷺ، وتی: ئەمە سوێندی بێت بەپاکی نەگەڕاوەتەوە!! ﴿[12] لولا إذ سمعتموه﴾ بۆچ کاتێ ئێوە ئەودەنگوو تۆمەتەتان بیست ﴿ظن المؤمنون والمؤمنات بأنفسهم خيرا﴾ پیاوان و ژنانی بڕوادار گومانی چاکیان بە یەکتر نەبرد ﴿وقالوا هذا إفك مبين﴾ ونەیانگوت: ئاشکرایە ئەمە بوختان و درۆیەکی زل و روونە، هەر وەك (ئەبوو ئەیوب) و خێزانەکەی وتیان.

بەڵێ ئەوانە (کوڕەکەی سەلوول) ونموونەیان لە زووەوە لە مەڵاسدابوون بۆ شکاندنی بنەماڵەی پەیامبەر ﷺ ﴿ ١٣
لولا جاؤا علیه بأربعة شهداء﴾ ئەی بۆ چ بوختانچییەکان چوار شایەدیان نەهێنا بۆسەلماندنی داواکەیان ﴿فإذ
لم یأتوا بالشهداء﴾ ئەوسا کە هەر شایەتیان نەهێنان ﴿فأولئك عند الله هم الکاذبون﴾ ئیتردیارە کەئەوانە بەلای
خواوە درۆزنن"، دیارە ئەمە هەڕەشەیەکە بۆهەموو بوهتانچییەك، بەتایبەت بۆ ئەهلی ئیفك ﴿ ١٤ ولولا فضل الله
علیکم ورحمته فی الدنیا والآخرة﴾ خۆ ئەگەر فەزڵ و میهرەبانی خوا نەبوایە لەسەرتان لە دونیاولە قیامەتدا
﴿لمسکم فیما أفضتم فیه عذاب عظیم﴾ توشی سزایەکی گەورەی سەخت دەبوون لە سەرئەو درۆیە لە سەری چوون
﴿ ١٥ إذ تلقونه بألسنتکم﴾ کاتێ دەمادەم ئەو درۆیەتان لە زمانی یەکتر وەرئەگرت و لەیەکترتان ئەپرسی ﴿وتقولون
بأفواهکم ما لیس لکم به علم﴾ و بە دەمتانا دەهات و هیچ زانیارییەکیشتان پێی نەبوو﴿وتحسبونه هینا﴾ پێشتان
وابوو هەروا شتێکی بچووك وئاسانە! ﴿وهو عند الله عظیم﴾ بەڵام ئەو بوهتانە بەلای خواوە زۆرناقۆڵاوگەورەبوو
﴿ ١٦ ولولا إذ سمعتموه قلتم ما یکون لنا أن نتکلم بهذا﴾ بۆچی کاتێ گوێتان لە و بۆختانەوەبوو نەتانگوت: ئێمە
بۆمان نییە ئەم قسەیە بکەین ﴿سبحانك هذا بهتان عظیم﴾ ئەبوایە (سبحان الله)تان بکردایەو، سەرتان سوڕ بمایە
لەو دڕۆو بوختانەو بتانوتایە: ئەمە تۆمەت و بوهتانێکی زۆرناقوڵاو گەورەیە!! بۆ هاوسەری پەیامبەر ﷺ "کراوە
﴿ ١٧ یعظکم الله أن تعودوا لمثله أبدا﴾ خوا ئامۆژگاریتان ئەکات کە هەرگیز کاری ئاوا دووبارە نەکەنەوە ﴿إن کنتم
مؤمنین﴾ ئەگەر ئێوە بڕوادارن بن ﴿ ١٨ ویبین الله لکم الآیات﴾ وە خوا بەڵگەو ئایەتەکانی خۆیتان بۆ ڕوون ئەکاتەوە"
کە دەلالەت لە سەر ڕوونکردنەوەی ئەحکامی تایبەت بە بوهتان کردن دەکات هاوڕێ لە گەڵ ڕێنمایی و وەعز
وهتد... ﴿والله علیم حکیم﴾ وخوا خۆی زۆر زانایەو"هیچی لێ بزر نابێ وبە هەموو شت دەزانێ, کار جوانیشە لە
دانانی هەموو حوکمێك لە جێی خۆیدا.

### دەنگۆو قاویی زینا بۆ بڕواداران:

﴿ ١٩ إن الذین یحبون أن تشیع الفاحشة فی الذین آمنوا﴾ بێگومان ئەو کەسانەی پێیان خۆشەو ئەیانەوێ کاری
ناشیرین و نادروست لەناو خەڵکانی بڕواداردا بڵاو ببێتەوە و ببێتە قاو ﴿لهم عذاب ألیم فی الدنیا والآخرة﴾ ئەوە
لەدونیاو لەئاخیرەتدا سزای پڕ بەئێشیان بۆ ئامادە کراوە" لەدونیادا داری حەددیان لێ ئەدرێ و" لەدوا ڕۆژیشدا
دۆزەخ جێگەیان دەبێت ﴿والله یعلم وأنتم لا تعلمون﴾ وە خوا هەموو شتێ ئەزانێ لە سەر ئێوە وە ئێوە نازانن
ئەوەی ئەو دەیزانێ ﴿ ٢٠ ولولا فضل الله علیکم ورحمته﴾ خۆ ئەگەر فەزڵ و میهرەبانیخوا نەبوایە لەسەرتان ﴿وأن
الله رؤوف رحیم﴾ و خواش بە سۆز ودڵاوا نەبووبا، ئەوا بەهۆی ئەو بوختانەوە هەمووتانی بە پەلە سزا دەدا بەڵام
لەو تاوان و گوناحە -پاش تۆڵە لێ سەندن- پاکی کردنەوە، پێشەوا (نەواویی) دەڵێت: (فیها براءة عائشة ﵂ براءة
قطعیة بنص القرآن العزیز، فلو شك فیها إنسان -والعیاذ بالله- صار کافرا مرتدا بإجماع المسلمین. قال إبن
عباس﵄: لم تزن إمرأة نبی من أنبیاء الله- صلوات الله وسلامه علیهم- وهذا إکرام من الله تعالی لهم). مسلم ب ١٧،
ل١١٧. واتە ئەم ئایەتەی: (إن الذین جاؤا بالإفك..) بەرائەت و پاکانەیەکی حەتمییە بۆ خاتوو (عائشە) بەدەقی
قورئانی پیرۆز، جا ئەگەر کەسێك بەگومان بوو تێیدا پەنا بەخوا، ئەوە بەکۆی دەنگی زانایان بەکافرو هەڵگەڕاوە
دادەنرێ. (ابن عباس) ئەڵێ: هەرگیز ژنی هیچ پێغەمبەرێك زیناکار نەبووە. وە ئەمەش ڕێز گرتن بووە لە خوای
باڵاوە بۆیان. (قورتوبی)یش ئەڵێ: (هیشامی کوڕی عەممار) وتی: لەپێشەوا (مالیك)م بیست دەیوت: هەرکەس
جوێن بە (ئەبوبەکر)، یاخود بە (عائیشە) بدا، ئەوە خوێنی حەڵاڵەو دەکوژرێت، چونکە خوا ئەفەرمووێت: (یعظکم

الله أن تعودوا لمثله أبدا ان كنتم مؤمنين) خاوەنی تەفسیری (کاشف) ئەڵێت: (إن الشيعة الإمامية يعتقدون أن نساء الأنبياء جميعهن عفيفات طاهرات، وأن النبي –أي نبي– لا يضع ماءه إلا في أرحام مطهرة، وأن زوجته قد تكون كافرة ولن تكون بغيا، لأن الرسول أكرم على ربه وأعز من أن يجعل تحته بغيا). واتە: هەموو شیعەی ئیمامی ئیتیفاقیان وایە کە: ژنانی هەموو پێغەمبەران خاوێن و داوێن پاکن، وە هیچ پێغەمبەرێك (ئاوی خۆی نەکردۆتە جێی حەرامەوە، بەڵێ.. دەشێ ژنە پێغەمبەرێ کافر بووبێ، بەڵام هەرگیز نەبووە داوێن پیس بووبێ. تەفسیری (مجمع البيان)یش ئەڵێت: (إن نساء الأنبياء يجب أن ينزهن عن مثل هذه الحال لأنها تشين، وقد نزه الله أنبياءه عما هو دون ذلك توقيرا لهم وتعظيما عما ينفر من قبول قولهم والعمل بدعوتهم).

الجزء الثامن عشر — سورة النور

الحزب ٣٦

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ وَمَن يَتَّبِعۡ
خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَإِنَّهُۥ يَأۡمُرُ بِٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِۚ وَلَوۡلَا فَضۡلُ
ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنۡ أَحَدٍ أَبَدٗا وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُزَكِّي
مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ﴿٢١﴾ وَلَا يَأۡتَلِ أُوْلُواْ ٱلۡفَضۡلِ مِنكُمۡ
وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤۡتُوٓاْ أُوْلِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينَ وَٱلۡمُهَٰجِرِينَ فِي
سَبِيلِ ٱللَّهِۖ وَلۡيَعۡفُواْ وَلۡيَصۡفَحُوٓاْۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغۡفِرَ ٱللَّهُ لَكُمۡۚ
وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿٢٢﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ٱلۡغَٰفِلَٰتِ
ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ لُعِنُواْ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿٢٣﴾
يَوۡمَ تَشۡهَدُ عَلَيۡهِمۡ أَلۡسِنَتُهُمۡ وَأَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ
﴿٢٤﴾ يَوۡمَئِذٖ يُوَفِّيهِمُ ٱللَّهُ دِينَهُمُ ٱلۡحَقَّ وَيَعۡلَمُونَ أَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡحَقُّ
ٱلۡمُبِينُ ﴿٢٥﴾ ٱلۡخَبِيثَٰتُ لِلۡخَبِيثِينَ وَٱلۡخَبِيثُونَ لِلۡخَبِيثَٰتِۖ
وَٱلطَّيِّبَٰتُ لِلطَّيِّبِينَ وَٱلطَّيِّبُونَ لِلطَّيِّبَٰتِۚ أُوْلَٰٓئِكَ مُبَرَّءُونَ
مِمَّا يَقُولُونَۖ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَرِزۡقٞ كَرِيمٞ ﴿٢٦﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُواْ لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتًا غَيۡرَ بُيُوتِكُمۡ حَتَّىٰ تَسۡتَأۡنِسُواْ
وَتُسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ أَهۡلِهَاۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ﴿٢٧﴾

٣٥٢ — فإن لم تجدوا

**له دووی شه‌یتان مه‌ڕۆن:**

دوای ئەوە خوای گەورە ئیمانداران بەگشتی هۆشیار ئەکاتەوەو ئەفەرمووێ: ﴿[21] يا أيها الذين آمنوا لا تتبعوا خطوات الشيطان﴾ ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بەدوای نەخشەو هەنگاوەکانی شەیتاندا مەڕۆن" واتە: گوێ مەگرن بە درۆو بوهتانکردن بە بڕواداران" چونکە ئەوەش لە هەنگاوەکانی شەیتانە ﴿ومن يتبع خطوات الشيطان﴾ هەرکەسێك شوێنی هەنگاوو پیلانەکانی شەیتان بکەوێ" دیارە ئەوە دووچاری کاری ناپەسەندو ناشیاو ئەبێت ﴿فإنه يأمر بالفحشاء والمنكر﴾ چونکە بێگومان شەیتان هەمیشە فەرمان بەکاری ناپەسەندو قێزەون ئەکات ﴿ولولا فضل الله عليكم ورحمته﴾ خۆ ئەگەر فەزڵ و میهرەبانی خوا نەبوایە لەسەرتان ﴿ما زكى منكم من احد أبدا﴾ یەك کەستان هەرگیز لەگوناح پاك و پوختە نەئەبووەوە، واتە: ئەگەر ئەو ڕێنموونی نەکردنایە بۆ پەشیمان بوونەوە قەت ڕێتان دەر نەئەکرد ﴿ولكن الله يزكى من يشاء﴾ بەڵام خوا میهرەبانی زۆرە، بۆیە بۆ هەرکەسێ خۆی حەزبکاو بیەوێ و شایستەش بێت" لەگوناحەکانی پاکی ئەکاتەوە ﴿والله سميع عليم﴾ چونکە خوا زۆر ژنەوایە بەوتەو کردارتان، زۆر زانایشە بە هەموو نیازو نیەتێکتان، جا کەواتە پەلە بکەن و پەشیمان ببنەوەو دەست لەبوختان کردن هەڵبگرن ﴿[22] ولا يأتل أولوا الفضل منكم والسعة﴾ ئەی خەڵکینە! بائەوانەتان دەوڵەمەندن و" خاوەنی فەزڵ و سامان و ماڵن سوێند نەخۆن ﴿أن يؤتوا أولى القربى والمساكين والمهاجرين فى سبيل الله﴾ کە بەخشش و کەرەمی خۆیان لە نزیکان و خزم و بێنەوایان و کۆچکەرانی ڕێگەی خوا بگرنەوە لەبەرئەو بوختانەی بەرامبەریان کرا، ئەڵبەتە یەکێ لەوانە دەستی خستبوو ناو مەسەلەکەی خاتوو عائیشەوە، (مسطح)ی پورزای پێشەوا (ئەبوبەکر) بوو، ئەو پیاوێکی زۆرلات و بێ دەسەڵات وهەژار بوو، ئەبوبەکر دەستگیرۆیی ئەکرد، کەچی کاتێ ئەو بوختانە پێش هات، ئەویش بەشی خۆی تێخست!! جا ئەبوبەکر سوێندی لێ خوارد ئیتر هیچی نەداتێ... ئەوسا خوایش ئەم ئایەتەی

دابەزاند ونەیی کرد لە پیاوانی مەردو جوامێرو دەهەندە کە سوێند بخۆن دەست بگرنەوە لە دەستگرۆیی خزمان وهەژاران و کۆچکەرانی ڕێگەی خوا. ﴿ولیعفوا ولیصفحوا﴾ دەبا ئەو جۆرە مەردانە عفویان بکەن وچاویان لێ بپۆشن" لەوەی بەسەریاندا دێت ببوورن و پشتگوێی بخەن و بڕۆنەوە سەر پیاوەتییەکەی جارانی خۆیان ﴿الا تحبون أن یغفر الله لکم﴾ مەگەر ئێوە - خاوەن بەخششان - خوا لێتان ببوورێت!! جا کاتێ ئیمامی (ئەبوبەکر) ئەو ئایەتەی بیست، وتی: (بلی أحب أن یغفر الله لی) بەڵێ.. بەڵێ پێم خۆشە، خوا لێم خۆشبێ، ئیتر پاش ئەوە جیرەکەی مستەحی ناردەوە بۆی و، لێی خۆش بوو، جا دوای ئەوەش (حەسان و، حیمنەو، میستەح) شەلاقی ئەو بوختانەیان لێ درا، دیارە ئەم ئایەتە ڕێزوپلەو جێگایەکی ئێجگارمەزنی ئەبوبەکر ﷺ نیشان ئەدات. (تەفسیری ئیبن کەسیر) ﴿والله غفور رحیم﴾ چونکە خوا زۆر لێبوردەیە، زۆریش بەسۆزو میهرەبانە.

**بوختان کردن بۆ ژنانی خاوەن باوەڕی بێ ئاگا:**

جا دوای باس کردنی ڕووداوەکەی (ئیفک) دێتە سەر باسی ئەوانەی وا بوختان بۆ ژنانی موسڵمان وداوێن پاك ئەکەن بەگشتیی و، خاتوو (عائیشە) بەتایبەتیی، بۆیە ئەفەرموێ: ﴿[٢٣] إن الذین یرمون المحصنات الغافلات المؤمنات﴾ بێگومان ئەوانەی بوختان بە ژنانی داوێنپاکی و بێ خەبەری بروادار دەکەن ﴿لعنوا فی الدنیا والآخرة﴾ لەدواڕۆژیشدا نەفرینیان لێکراوە ﴿ولهم عذاب عظیم﴾ لەگەڵ ئەوەشدا سزایەکی گەورەشیان بۆ ئامادەکراوە" ﴿[٢٤] یوم تشهد علیهم ألسنتهم وایدیهم وأرجلهم بما کانوا یعملون﴾ لەو ڕۆژەدا زمان و دەست و پێییان دەبێتە شایەد لەبەرامبەر ئەو کارانەوە دەیان کرد، جا یا هەر بەواقیعی ئەوانە دێنە قسەو گفتوگۆ و، هەریەکەیان قسەی خۆی ئەکات و، یەکە یەکە ئەو شتانە ئەڵێت کردوویانە، یان هەر شتێکیان کردبێت لەسەریان تۆمار کراوەو لێی ئاشکرا دەبێت، وەك ئیمزاو مۆرو —طبع الأصابع—ی پەنجەکان، کە ئیمڕۆ گەلێ تاوانیان پێ ئاشکرا دەکرێ ﴿[٢٥] یومئذ یوفیهم الله دینهم الحق﴾ لەو ڕۆژەدا خوای گەورە تۆڵەو جەزای بە جێیان دەدا. ﴿ویعلمون أن الله هو الحق المبین﴾ ئەوسا چاك ئەزانن کە بەڕاستیی خوایە زاتی هەقی ئاشکراکەری هەموو شتێك. تەفسیری (کەشاف) ئەڵێت: لە تەواوی قورئاندا تاوانێك نییە کە خوای گەورە بەو توندو تیژیە هەڕەشەی لێ کردبێت وەك ئەوە هەڕەشە لەبوختان کەرانی خاتوو عائشە دەکات خوا لێی رازی بێت.

**پاکان بۆ پاکان، ناپاکانیش بۆ ناپاکان:**

﴿[٢٦] الخبیثات للخبیثین﴾ ژنانی پیس و ناپاك بۆ پیاوانی پیس وناپاکن ﴿والخبیثون للخبیثات﴾ وە پیاوانی پیس و ناپوختیش بۆ ژنانی پیس و ناپاکن، چونکە هاو تەرازووی یەکن ﴿والطیبات للطیبین﴾ و ژنانی پاکیش بۆ پیاوانی پاك ﴿والطیبون للطیبات﴾ و پیاوانی پاکیش بۆ ژنانی پاکن، چونکە هیچ لایەکیان بەدناو نەبوون، ئەم ئایەتەش بەڵگەیە بۆ پاك وخاوێنی خاتو عائشە -خوا لێی رازی بێت- چونکە ئەگەر پاك نەبووبا بۆ پێغەمبەر ﷺ نەدەبوو ﴿أولئك مبرؤن مما یقولون﴾ ئەمانە (عائشەو صەفوان) دوورو بەرین لەو تۆمەتانەی ناپاکان ئەیڵێن و ڕەواجی پێئەدەن ﴿لهم مغفرة ورزق کریم﴾ لەپاداشتی ئەو بوختانەدا بۆیان کراوە و ڕۆزییەکی نەبڕاوەیان لەبەهەشتدا بۆ هەیە.

**بێ ئیزن سەر بەماڵی هیچ کەسێکدا مەکەن:**

ئینجا بۆ ئەوەی کۆمەڵ وکۆمەڵگە, بەپاکی بمێنێتەوەو نەتوانن بوختان بۆ یەکتری بکەن ,بەرنامەی زیارەت وسەردانی یەکتر ڕێدادەنێت,بۆیە دەفەرموێ: ﴿[٢٧] یا أیها الذین آمنوا لا تدخلوا بیوتا غیر بیوتکم﴾ ئەی ئەوانەی

باوەڕتان هێناوە! بێ لە ماڵی خۆتان مەچنە هیچ ماڵێکی تر ﴿**حتى تسأنسوا وتسلموا على أهلها**﴾ تا مۆڵەت دەخوازن وسڵاوله دانیشتووان و خاوەن ماڵەکان دەکەن ﴿**ذلكم خير لكم**﴾ ئائەوە بۆ ئێوە چاکترە, تا بەبێ مۆڵەت خۆتان بکەن بە ژوورا ﴿**لعلكم تذكرون**﴾ بەشکو لەو شێوەیە پەندو ئامۆژگاری وەر بگرن و کاری پێبکەن. پیاوێك وتی: ئەی پەیامبەری خوا ﷺ! ئایا دەبێ لەدایکشم مۆڵەت وەربگرم؟ ئەویش فەرمووی: بەڵێ" کابرا وتی: ئاخر جگە لەمن کەسێکی دیکەی نیە خزمەتی بکا؟ پەیامبەریش فەرمووی: باشە پێت خۆشە دایکت بەرووتی ببینی؟ کابرا وتی: نا، ئەویش فەرمووی کەواتە هەرکاتێ دەتەوێ بچیتە ژوورەکەیەوە ئاگاداریی بکە" ئەوجا بچۆ ژوورەوە. ئیمامی (بەیهەقیی و تەبەریی) ریوایەتیان کردووە ﴿[28] **فإن لم تجدوا فيها أحدا**﴾ ئینجا ئەگەر کەسێکتان لەو ماڵانەدا دەست نەکەوت مۆڵەتتان بدا، وە یا زانیتان کەس لەماڵ نیە ﴿**فلا تدخلوها حتى يؤذن لكم**﴾ مەچنە ژوورەوە تا مۆڵەتتان ئەدرێ لەلایەن کەسێکەوەئیزنیبەدەست بێ، چونکە خانوو بەرە رێزو حورمەتێکی تایبەتی خۆی هەیە، هیچ کەسێك بۆی نیە حورمەتی بشکێنێ ﴿**وإن قيل لكم إرجعوا**﴾ خۆ ئەگەر پێشتان وترا بگەڕێنەوە (لەبەر هەر هۆیەك بێت) ﴿**فارجعوا**﴾ ئێوەش بەبێ دڵگرانی ونارەحەتی بگەڕێنەوە ﴿**هو ازكى لكم**﴾ ئەوەش بۆئێوە باشترو چاکترە ﴿**والله بما تعملون عليم**﴾ خواش ئاگادارو زانایە بە هەرچی ئێوە ئەیکەن. کەواتە پێویستە رێزو حورمەتی خانەو مەنزڵی هەموو کەسێك بپارێزرێ, وەنابێ هەرکەس بە ئارەزوو خۆی بکات بە ژووری هیچ کەسێکی تردا.

سُورَةُ النُّورِ — الجزء الثامن عشر

فَإِن لَّمْ تَجِدُوا۟ فِيهَآ أَحَدًا فَلَا تَدْخُلُوهَا حَتَّىٰ يُؤْذَنَ لَكُمْ ۖ وَإِن قِيلَ لَكُمُ ٱرْجِعُوا۟ فَٱرْجِعُوا۟ ۖ هُوَ أَزْكَىٰ لَكُمْ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴿٢٨﴾ لَّيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَدْخُلُوا۟ بُيُوتًا غَيْرَ مَسْكُونَةٍ فِيهَا مَتَٰعٌ لَّكُمْ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا تَكْتُمُونَ ﴿٢٩﴾ قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا۟ مِنْ أَبْصَٰرِهِمْ وَيَحْفَظُوا۟ فُرُوجَهُمْ ۚ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴿٣٠﴾ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَٰرِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ۖ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ۖ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ ءَابَآئِهِنَّ أَوْ ءَابَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَآئِهِنَّ أَوْ أَبْنَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَٰنِهِنَّ أَوْ بَنِىٓ إِخْوَٰنِهِنَّ أَوْ بَنِىٓ أَخَوَٰتِهِنَّ أَوْ نِسَآئِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُنَّ أَوِ ٱلتَّٰبِعِينَ غَيْرِ أُو۟لِى ٱلْإِرْبَةِ مِنَ ٱلرِّجَالِ أَوِ ٱلطِّفْلِ ٱلَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا۟ عَلَىٰ عَوْرَٰتِ ٱلنِّسَآءِ ۖ وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ ۚ وَتُوبُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٣١﴾

٣٥٣

**تێبینی:** ئیمامی ئەحمەد -خوا رەحمی پێ بکا- ئەڵێ: ئینسان هەرکات گەڕایەوە بۆ ماڵی خۆی، چاك وایە لەدەم دەرگادا بکوکێ، یا پێ بکوتێ بە ئەرزدا، هەر بۆیە پێغەمبەر ﷺ رێ نادا بەوانەی - لەسەفەرێکی دوور دەگەڕێنەوە- بێ ئاگادار کردنەوەی ماڵ و منداڵ بەشەو خۆیان بکەن بەماڵا! لە فەرموودەیەکی دیکەدا هاتووە: کاتێ پێغەمبەر ﷺ لەسەفەر دەگەڕایەوە، لەنزیك شاری مەدینەدا بارخانەیان دەخست تاکو نزیکی ئێوارە، ئەوسا ئەیفەموو: با ئەو ژنانە ئامادە نین بۆ پێشوازی مێردەکانیان, خۆ ئامادە بکەن و، پاك و تەمیزی خۆیان بکەن و، پرچەکانیان شانە بکەن. (متفق عليه). خێزانی (عەبدوڵڵای کوری مەسعود) ئەڵێ: هەرکات عەبدوڵڵا ئەگەڕایەوە بۆ ماڵ لەدەم دەرگاکەدا ئەکۆکی و، توفی دەکردەوە، تا بێ ئاگاداری ئێمە نەیێتە ژورەوەو شتێ ببینێ، حەزی پێ نەکا. ﴿[29] **ليس عليكم جناح**﴾ هیچ جۆرە سەرکۆنەو گوناهێکتان لەسەرنییە بێ مۆڵەت وەرگرتن ﴿**أن تدخلوا بيوتا غير مسكونة**﴾ کە بچنە ماڵێکەوەچوڵ بێ و کەسی تیا نیشتەجێ نەبێ، وەك میوانخانەو دام و دەزگا حکومییەکان و مزگەوت وشوێنەگشتییەکان... ﴿**فيها**

﴿متاع لكم﴾ کەل و پەلی ئێوەی تێدا بێت ﴿والله يعلم ما تبدون وما تكتمون﴾ ئێوە هەرچی دەر بخەن و، هەرچیش بشارنەوە خوا دەیزانێو ئاگادارە لێی ، دەزانێ بە چ مەبەستێکەوە ئەچنە ئەو مالانەوە.

**لە ژنانی نامەحرەم چاو داخەن:**

ئینجا لەم چەند ئایەتەشدا خوا ڕێنمایی موسلمانان دەکات ، بۆ وەزەن نەکردن لە ژنان و،چاو نووقاندن هەمیشە لە ئاستیان: ﴿[٣٠] قل للمؤمنين يغضوا من أبصارهم﴾ ئەی موحەممەد ﷺ بەپیاوانی بڕوادار بڵێ: چاو بنووقێنن لەئاستی ژنانی نامەحرەمدا " واتە لەئاستی ئەوانەی وا ئەتوانن مارەیان بکەن" چونکە لە چاو داخستندا دەرگای هەموو خراپەیەك دائەخرێت. (ئەحمد شەوقیی) چەندەجوان ئەڵێت:

نظرة فابتسامة فسلام *** فكلام فموعد فلقاء

﴿ويحفظوا فروجهم﴾ وە داوێن و عەورەتی خۆیان بپارێزن ﴿ذلك ازكى لهم﴾ بێگومان ئەوە باشترە بۆیان ﴿إن الله خبير بما يصنعون﴾ بێگومان خوا بەو هەموو ئاکارانەیان بە ئاگایە" دیارە ئەمە هەڕەشەیەکی سەختە لەوانەی سنووری خوا ئەشکێنن.

**جل و بەرگی بالا پۆش (حیجاب):**

﴿[٣١] وقل للمؤمنات يغضضن من أبصارهن ويحفظن فروجهن﴾ بەژنانی باوەڕدار بڵێ: باچاویان دابخەن لەتەماشای نامەحرەم و، عەورەتیشیان بپارێزن لەگوناه ﴿ولا يبدين زينتهن إلا ما ظهر منها﴾ زینەت و جوانی وخشڵی خۆیان دەرنەخەن لەئاستی نامەحرەم، بێجگە لەوەی لێیدەردەکەوێ، واتە: ئەو ئەندامانە نەبێت لە کاتی ئیش و کاری ناو ماڵدا دەرئەکەون وەك دەم و چاوو هەردوو دەست -وەك ئیبن عەبباس دەڵێ -، ئەوە قەیناکات. (شێخی بەیزاوی) یش ئەڵێت: قسەی ڕاست ئەوەیە: مۆڵەتدان بۆ دەرکەوتنی دەم و چاوو هەردوو دەست تەنها بۆ کاتی ئەنجامدانی نوێژەکانە، نەك لە دەرەوەی نوێژەکان، چونکە هەموو جەستەو لاشەی ژنان عەورەتەو، ڕەوا نییە دەرخستنی و تەماشا کردنی، بۆ مێردو مەحرەم نەبێت، وەهەروەها یاساغە بۆ نامەحرەم تەماشای هەر جێگایەکی ژنان بکات، مەگەر کاتی ناچاریی، وەك سەیرکردنی پزیشکی پیاو، کاتێ پزیشکی ژن نەبێت، یاکاتێ بۆ هەڵگرتنی شایەتی بێت. بەشێکی زۆر لە زانایان ئەڵێن: نابێ ئافرەتیش سەیری هیچ شوێنێکی پیاوان بکا، نەبە ئارەزووەوە، نەبە ناچاریی، بەبە ڵگەی ئەم فەرموودەیە (ئیمامی تیرمزیی) ئەیگێڕێتەوەلە (ئوم سەلەمە) وەکە ئەوو (خاتوو مەیمونە) لای پێغەمبەر ﷺ بوون، جالەوکاتەدا (ئیبن ئومی مەکتومی) نابینا هات، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: چاوی خۆتان بگرن لە نەزەرو،خۆداپۆشن! ئوم سەلەمە ئەڵێ: وتم: باشە! ئەی ئەو نابینا نیيە؟ فەرمووی ئەی بۆ ئێوەش ئەو نابینن؟. هەندێکی دی پێیان وایە نواڕینی ژنان بۆ پیاوی نامەحرەم بەبێ ئارەزوو و ئەنقەست ڕەوایە، وەك لە فەرموودەیەکی (متفق عليه) دا هاتووە: (حەبەشە) ییەکان ڕۆژی جەژن شەڕەنێزەیان ئەکرد لەمزگەوتدا پێغەمبەرﷺ خۆیشی سەیری دەکردن و خاتوو عائیشەیشی لەپشت خۆیەوە دانابوو سەیری دەکردن. ﴿وليضربن بخمرهن على جيوبهن﴾ با گۆشەی سەرپۆش و لەچکەکانیان بدەن بەسەر سینگیشیاندا تا گەردن و سینگ وبەرۆکیان دەرنەکەوێ ﴿ولا يبدين زينتهن إلا لبعولتهن﴾ وخشڵ و جوانیی و زینەتیان "سەرو مل وگوێ وسنگ وقۆڵ وباڵ ولاقیان" دەرنەخەن بۆ مردەکانیان نەبێت ﴿أو آبائهن او آباء بعولتهن﴾ یان بۆ باوکیان، یان بۆ باوکی شووەکانیان "خەزوریان" ﴿او ابنائهن﴾ یان بۆ کوڕی خۆیان ﴿او ابناء بعولتهن﴾ یان بۆ کوڕانی مێردەکانیان ﴿او إخوانهن﴾ یان بۆ براکانی خۆیان ﴿او بني إخوانهن﴾ یان بۆ کوڕی براکانیان ﴿او بنى اخواتهن﴾ یان بۆ کوڕی خوشکەکانیان

چونکە ژیان لەگەڵ ئەو جۆرە کەسانەدا کەمتر چاوەڕوانی فیتنەو کاری خراپیان لێوە دەکرێ. جا لەبەر ئەوە بۆ ژنان ڕەوایە دەست و پێ و لاق و سەرو مل و سینگ لە لای ئەوانەدا دەر بخەن، ئەڵبەتە بۆ مێردەکانیان زیاتریش لەوانە دروستە ﴿أو نسائهن﴾ یا بۆ ژنانی هاوبڕوایان" وەك خۆیان، بەڵام نابێ لەلای ژنێکی پاشگەز بووە، یان لەلای ژنانی جوولەکەو گاوردا خۆیان دەر بخەن ﴿أو ماملكت ايمانهن﴾ یان ژنە بەندەکانیان -کەنیزان-، بەڵام زانایان لەنێری خولامیاندا قسەی جیاوازیان هەیە ﴿أو التابعين غير اولى الإربة من الرجال﴾ یان پیاوانی شوێنکەوتووانی ژنان بێ ئارەزوو بێ نیاز، (لەخزمەتکارو گێلە پیاو) کە هەستی ژن و مێردییان نیە ، جا لەبەر پیریی، یان لەبەر پەتەڕییان، یان لەبەر ئەوە کەڵکی ژن و مێردییان پێوە نەبێ، مەبەستیشیان لە شوێنکەوتنیان تەنها تێرکردنی ئارەزووی زکیانە ﴿أو الطفل الذين لم يظهروا على عورات النساء﴾ یان ئەو منداڵانەی ئاگایان لەبەدەن و جێ شەرمی ژنان نیە و، هێشتا باڵغ نەبوون و کاروباری ژن و مێردی نازانن، دیارە ئەوەش گوناە نیە ژنان دەست و پێ و مل و سنگیان لەلایاندا وەدەرخەن ﴿ولا يضربن بأرجلهن ليعلم ما يخفين من زينتهن﴾ وە هەروەها ژنان -لەکاتی ڕۆیشتندا- نابێ پێیان بەزەویدا بدەن کە بزانرێت چ خشڵ و زینەتێکیان داشاردووە. لەسەردەمی نەفامیدا ژنان بەلای خەڵکدا ئەڕۆیشتن و توند قاچیان بەزەوییدا دەداو خرەی خرخاڵ و پاوانەو بازنەکانیان ئەهات تا مەردوم سەیریان بکات، جا خوای گەورە فەرمووی نابێ ئەو کارە بکەن، ئێستایش گەڵێ لە ژنان جۆرە پێڵاوێ لە پێ ئەکەن و لەکاتی ڕۆیشتندا توند بەزەویی دەدەن و تەقەی دێت!! ﴿وتوبوا إلى الله جميعا أيها المؤمنون﴾ کەوابوو ئەی باوەڕداران! هەمووتان بەرەو لای خوا بگەڕێنەوەو پەشیمان ببنەوەو چاوتان لەئاستی نامەحرەم دابخەن و عەورەتتان بپارێزن.. ﴿لعلكم تفلحون﴾ بەشکو گشتیان هەم لەدونیاو، هەم لەقیامەت، ڕزگارو بەختیار بن و، بۆ هەتا هەتاییش لەگوناهو سەرپێچی دوور بکەونەوە.

الجزء الثامن عشر — سورة النور

وَأَنكِحُوا الْأَيَامَىٰ مِنكُمْ وَالصَّالِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَائِكُمْ إِن
يَكُونُوا فُقَرَاءَ يُغْنِهِمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٣٢﴾
وَلْيَسْتَعْفِفِ الَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحًا حَتَّىٰ يُغْنِيَهُمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ
وَالَّذِينَ يَبْتَغُونَ الْكِتَابَ مِمَّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ
عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا وَآتُوهُم مِّن مَّالِ اللَّهِ الَّذِي آتَاكُمْ وَلَا
تُكْرِهُوا فَتَيَاتِكُمْ عَلَى الْبِغَاءِ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا لِّتَبْتَغُوا عَرَضَ الْحَيَاةِ
الدُّنْيَا وَمَن يُكْرِههُّنَّ فَإِنَّ اللَّهَ مِن بَعْدِ إِكْرَاهِهِنَّ غَفُورٌ رَّحِيمٌ
﴿٣٣﴾ وَلَقَدْ أَنزَلْنَا إِلَيْكُمْ آيَاتٍ مُّبَيِّنَاتٍ وَمَثَلًا مِّنَ الَّذِينَ خَلَوْا
مِن قَبْلِكُمْ وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٣٤﴾ ۞ اللَّهُ نُورُ السَّمَاوَاتِ
وَالْأَرْضِ مَثَلُ نُورِهِ كَمِشْكَاةٍ فِيهَا مِصْبَاحٌ الْمِصْبَاحُ فِي زُجَاجَةٍ
الزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوْكَبٌ دُرِّيٌّ يُوقَدُ مِن شَجَرَةٍ مُّبَارَكَةٍ زَيْتُونَةٍ
لَّا شَرْقِيَّةٍ وَلَا غَرْبِيَّةٍ يَكَادُ زَيْتُهَا يُضِيءُ وَلَوْ لَمْ تَمْسَسْهُ نَارٌ
نُّورٌ عَلَىٰ نُورٍ يَهْدِي اللَّهُ لِنُورِهِ مَن يَشَاءُ وَيَضْرِبُ اللَّهُ الْأَمْثَالَ
لِلنَّاسِ وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴿٣٥﴾ فِي بُيُوتٍ أَذِنَ اللَّهُ أَن تُرْفَعَ
وَيُذْكَرَ فِيهَا اسْمُهُ يُسَبِّحُ لَهُ فِيهَا بِالْغُدُوِّ وَالْآصَالِ ﴿٣٦﴾

ربع الحزب ٣٦

رِجَالٌ لَّا تُلْهِيهِمْ ٣٥٤

### ژنانی بێ مێرد بە شوو بدەن:

جا دوای باس کردنی چاو داخستن و پاراستنی عەورەت، ئەفەرموێ: ﴿[٣٢] وانكحوا الأيامى منكم﴾ ئەی موسڵمانان! ژنە بێمێردەکانتان بەشووبدەن، بۆ پیاوە بێ هاوسەرەکانیشتان، هاوسەر پەیدا بکەن، واتە: هاوکاریی و، یارمەتی نێرینەکانتان بدەن با ژن بێنن، ئاسانکاری و ڕێگەش بۆ ژنان خۆش بکەن با مێرد بکەن ﴿والصالحين من عبادكم و إمائكم﴾ بۆ بەندەو کەنیزەچاك و صاڵحەکانیشتان هەروا بکەن, واتە: بو بەندەکان ژن بهێنن و، کەنیزەکانیش بەشووبدەن، بە کورتیی: خوای گەورە فەرمان بەسەرپەرشتی کارانیان ئەدا کە بەندەی بێ ژن، یان کەنیزەکی بێ مێرد نەهێڵنەوە، تا فەساد و خراپە روو نەدات ﴿إن يكونوا فقراء يغنهم الله من فضله﴾ ئەگەر

لات و دەستەنگیش بن، دڵ سارد مەبن لێیان، چونکە خوا لە فەزڵ و میهرەبانی و بەهرەی خۆی بێنیازو دەوڵەمەندیان ئەکات ﴿والله واسع عليم﴾ وە خوا خۆی پەرەدەرو بەخشەرو، زۆر زانایە بە بەرژەوەندی بەندەکانی. واتە: هەژاریی مەکەنە لەمپەر لە بەردەم خواستنی خوازراوەکەتان، چونکە خوا بەخشش و بەهرەی زۆرە.

ئینجا روو ئەکاتە ئەوانەی دەسەڵاتی ژن هێنانیان نیە و ئەفەرموێ: ﴿[٣٣] وليستعفف الذين لا يجدون نكاحا﴾ با ئەوانەش دەسەڵاتی زەماوەندو ژن هێنانیان نیە، بەردەوام بە(عیففەت) خۆرابگرن و بە پاکی رەفتاربکەن ﴿حتى يغنيهم الله من فضله﴾ هەتا خوا لە فەزڵ و بەهرەی خۆی دەروێکیان لێ دەکاتەوە ودەوڵەمەندو بێنیازیان ئەکا ﴿والذين يبتغون الكتاب مما ملكت أيمانكم﴾ ئەو بەندانەشتان , ئەیانەوێ خۆ رزگار بکەن و لە کۆیلایەتی ئازاد ببن ﴿فكاتبوهم إن علمتم فيهم خيرا﴾ پسووڵەیان بۆ بنووسن و بیکەنە مانگانە بەسەریانەوە، ئەگەر خێرو چاکەو تواناییکارکردن و خۆ ئازاد کردنتان لێدیتن , واتە:ئەتانزانی ئەمانەت و فامیان تیایەو، ناوەرۆکی پسووڵەتان بۆجێبەجێ ئەکەن ﴿وآتوهم من مال الله الذي آتاكم﴾ لەو ماڵ و سامانەش خوا پێیبەخشیون، بەشیان بدەن، زەکات بێ، یان صەدەقە، بۆ ئەوە بتوانن خۆ ئازاد بکەن پێی، ئەمەیە کە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ ((ثلاثة حق على الله عونهم: الناكح يريد العفاف، والمكاتب يريد الأداء، والغازي في سبيل الله)) رواه الامام احمد، والترمذي، والنسائي، وابن ماجه). سێ کەس هەن، هەقە کە خوا یارمەتییان بدات: ژن هێنەر بەمەبەستی خۆ لادان لە گوناح، هاوکاری خاوەن نامە وپسووڵەدارەکان , ئەوانەیان دەیانەوێ حەقەکە جێبەجێ بکەن , موجاهید لەپێناوی سەر خستنی ئایینی خوادا. پێشەوا (موسلیم و ئەبو داود) ئەڵێن: (عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی)مونافیق، دوو کەنیزەکی هەبوو، گەلێ جار بۆ زیناو شەرواڵ پیسیی زۆری لێ ئەکردن!! ئینجا هەر ئەوکەنیزانە سکاڵایان بردەلای پێغەمبەرﷺ، (سەدی) ئەڵێ: بۆ قێزەونکردنی ئەو جۆرە خووە ناپەسەندانە خوا فەرمووی: ﴿ولا تكرهوا فتياتكم على البغاء﴾ هەرگیز کەنیزەکانتان ناچارمەکەن بۆ داوێن پیسیی، واتە: لەبەر بەدەست هێنانی دەستکەوتێکی دونیایی ناچاریان مەکەن بەزیناو لەشفرۆشی خۆیان. ﴿إن أردن تحصنا﴾ ئەگەر ویستیان داوێن پاکبن، واتە: زۆر کارێکی ناپەسەندو نابەجێیە فەرماندان بە لەشفرۆشی وشەرواڵ پیسیی، بەتایبەت کە خۆشیان لەوکارە ناشیرینە بێزاربن. بەڵێ ئافرەتان بەسروشت -وەك دەڵێن- هێزی ئارەزووی جنسییان زیاترە، جاکەوابوو زۆر عارە لەسەر خاوەنەکانیان ئەو ژنە داوێن پاکانە لەکاتی خۆیدا بەشوو نەدەن و ناچاریان بکەن بۆ لەشفرۆشی ڕوونکردنەوەیەك: بەپێی زانیاری (علم الأصول) ئەم ئامێرو ئەداتی شەرتە: (إن)، بۆ بەیانی واقیعە، کەواتە هیچ مەفهومێکی موخالەفەی نییە. (ئیبن کەسیر) ئەڵێ: (هذا-الشرط-خرج مخرج الغالب فلا مفهوم له). ﴿لتبتغوا عرض الحياة الدنيا﴾ بۆ ئەوە هەتا ماڵ و سامانی ژیانی ئەم دنیایەتان دەسکەوێ، وەك مارەیی و،بە کرێدانیان و، منداڵەکانیان ﴿ومن يكرهن﴾ جا هەرکەسێك بەزۆر ناچاریان بکات بۆ زیناو شەرواڵ پسیی و، پاشانیش پەشیمان ببێتەوە ﴿فإن الله من بعد إكراههن غفور رحيم﴾ بێگومان خوا لەپاش زۆر لێکردنیان- بۆ ئەو کارە ناپەسەندە- زۆر لێبوردەیەکی میهرەبانە. ﴿[٣٤] ولقد انزلنا إليكم آيات مبينات ومثلا من الذين خلوا من قبلكم وموعظة للمتقين﴾ بێگومان ئێمە چەندین ئایەتی روونکەرەوەی ئەحکاممان بۆ دابەزاندن، وێرای چەندین نموونەو بەسەرهات وداستانی ئەو گەلانەی بەر لە خۆتان بوون، هەروەها لەگەڵ پەندو ئامۆژگارییەك بۆ خەڵکانی لەخواترس، ئەوانەی کە ئامادەییان تیایە بۆ ترس لەخوا" هەندێ لەپیاوە وردەکارەکان ئەڵێن: کاتێ (یوسف) بوختانەکەی بۆکرا، خوای گەورە لەسەر زمانی منداڵێك - کە هێشتای لە لانکەدا بوو- پاکانەی بۆ کرد، کاتێکیش خاتوو (مەریەم) تووشی ئەو بوختانە

بوو، ئەویش هەر لەسەر زمانی منداڵی (عیسا)ی کورپیدا پاکانەی بۆ کرا، بەڵام کاتێ خاتوو عائیشە تووشی ئەو بوختانە گەورەیە کرا، خوا خۆی لەقورئاندا پاکانەی بۆکرد. هەروەها باسکردنی هەواڵ و داستانی گەلانی رابردووی پێش ئێوەش، بەتایبەت یوسف و مەریەم کە ئەشوبهێ بەبەسەرهاتەکەی خاتو عائیشەوە دڵدانەوەیە هەم بۆ پێغەمبەر، هەم بۆ خاتوو عائیشە.

## ئەزیلەی نوورو ڕووناکی خوا:

بەڵێ کاتێ خوا لەم سورەتەدا گەلێ حوکمی روون کردەوە. ئێستا دێتە سەر ئەوباسەیە کە خوا هەر خۆی خاوەنی هەموو نوورو رووناکییەکە لە دنیاو لەقیامەتدا, ئەفەرموێ: ﴿[٣٥] الله نور السموات والأرض﴾ هەر خوایە نوورو رووناکیی ئاسمانەکان و زەویی.

ئەوەیە کە لەئاسماندا ئەو هەموو ئەستێرەو بەڵگانەی دروستکردووە، لەزەویشدا پەیامبەری ناردووە بەو هەموو بەڵگەو ئەحکامەوە، خەڵکی پێ شارەزاو ڕێنموونی بکات بۆ ڕێبازی ڕاستیی، خوا هەر خۆیەتی داهێنەری ئەم بوونەوەرە، هەر خۆیەتی هۆی دەرکەوتن لەم بوونەوەرەدا، ڕێنموونکارو، راوێژکاری ئاسمانەکان و زەوییە، دروستکراوەکان هەموو بە نووری ئەو ڕێ دەر ئەکەن، هەر بە فەرمان و بڕیاری ئەو ئەسوورێن ﴿مثل نوره كمشكاة فيها مصباح﴾ نموونەی نوورو رووناکی ئەوخوایە, وەك تاقێکە کەچرایەکی گەورەی پرشنگداری پڕ نووری تێدا هەڵکرابێت ﴿المصباح في زجاجة﴾ چراکەش لەناو چوار چێوەیەکی پاکی درەوشاوەی شووشەیەکدا بێت ﴿الزجاجة كأنها كوكب دري﴾ شووشەکەش وەك ئەستێرەیەکی پرشنگدارو گەش بێت ﴿يوقد من شجرة مباركة زيتونة﴾ چراکە لەدار (زەیتوون)ێکی بە فەڕو بە بەرەکەت, ڕۆن وسووتەمەنیەکەی وەربگیرێ ﴿لا شرقية ولا غربية﴾ دارەکەشی نەهەمیشە لەبەر خۆرگەیە, تابە درێژایی ڕۆژ ,خۆر لێی بدا، نەهەمیشەش لە نزارو سێبەردایە, تا قەت خۆر لێی نەدات, بەڵکو لە شوێنێکدا ڕوابێت خۆرانگەز نەبێو بە هەمیشەش سەوزو جوان بێت ﴿يكاد زيتها يضيء﴾ ڕۆنەکەشی ئەوەندە پاك وپاکژ بێت, نزیك بێت هەر لە خۆیەوە گڕ بگرێ ﴿ولو لم تمسسه نار﴾ بە بێ ئەوە ئاگریشی بەر کەوێ, چونکە زەیتی ڕەسەن, ئەوەندە جوانە کاتێ سەیری ئەکەی, دەڵێیت بێ ئەوە ئاگری تخون کەوێ خۆی داگیرسێ، کاتێ ئاگریشی ئەگاتێ شوڵەو رووناکیەکەی زیاتر ئەبێت, دڵی باوەڕدارانیش ئاوایە، بەنوورو ڕووناکی خوا دائەگیرسێ، پێش ئەوە ڕێنوێنی و شارەزا بکرێ, جا هەر کاتێکیش باسی ئیسلامی بۆ کرا ورێنما بوو، ئەوا بە زوویی بەرەو ڕێگەی ڕاست ئەڕوا و هیدایەت ئەبێ ﴿نور على نور﴾ ڕووناکی لەسەر ڕووناکیی، تاقەکە، چراکە، شووشەکە، زەیتە پاکەکە، ئەمانە هەر هەموو ئەبنە هۆی زێدە ڕووناکیی و بریقەی چراکە ﴿يهدي الله لنوره من يشاء﴾ بێگومان خوا ویستی لەهەر کەسێك ببێ، ئەوا ڕێنموونی ئەکات بۆ نوورو رووناکی خۆی ﴿ويضرب الله الأمثال للناس﴾ و خوا هەمیشە بۆ خەڵکی نموونە دێنێتەوە، بۆ ئەوەی باشترو چاکتر تێ بگەن ﴿والله بكل شئ عليم﴾ وە خوا بەهەموو شتێك زاناو ئاگادارە، ئەزانێ کێ شایستەی هیدایەتە.

## ڕێزی مزگەوتەکان و یادی خوا:

ئینجا خوا باسی شوێن وجێگاخوا پەرستییەکانیان بۆ ئەکاو دەفەرموێ: ﴿[٣٦] في بيوت أذن الله أن ترفع﴾ لەناو چەند ماڵ و مزگەوتێکدا خوا مۆڵەتی داوە کە دەستی ڕێزیان لە بان بێ، ئەو مزگەوتانەش دەبێ تەنها لەسەر ناوی ئەو بینابکرێن، تا ببنە مەنارەی هیدایەت و تیشکی رۆحیی ﴿ويذكر فيها اسمه﴾ وە دەبێ تەنها ناوی ئەویان تیا ببرێت ﴿يسبح له فيها بالغدوّ والآصال﴾ بە بەیانی و ئێوارانـدا, نوێژو ستایش و تەسبیحاتی پاکی ئەودەکەن:

﴿[٣٧] رجال لا تلهيهم تجارة ولا بيع عن ذكر الله وإقام الصلاة وإيتاء الزكاة﴾ پیاوانێك بازرگانیی و كڕین و فرۆش,
لەیادی خوا و لە بەرپاكردنی نوێژو بەخشینی زەكات غافڵیان ناكا، واتە: لەلایەكەوە هەردەم خەریكی پەیدا كردنی
ژیان و ژیوارن و، لەلایەكی تریشەوە یادی خوا دەكەن و, هەر كات بانگ گوترا, ئەوان بەپەلە ئەڕۆن بەدەم
نوێژەكانیانەوە، وە هەركاتێكیش زەكاتیان كەوتە سەر، بەخێرایی جێبەجێی ئەكەن ﴿یخافون یوما تتقلب فیه
القلوب والأبصار﴾ لەڕۆژێك ئەترسن كە دڵ و چاو تێیدا گش ئەگەڕێن و وەر دەچەرخێن، واتە: لە ڕۆژێ ئەترسن
ئاخۆ لە چ لایەكەوە فریشتەی سزا بیانگرن و، نامەیان چۆن بدرێتێ؟ ﴿[٣٨] لیجزیهم الله احسن ما عملوا﴾ بەردەوام
ئابەو شێوەیە سەرگەرمی خواپەرستین، تا خوا لەبەرامبەر كردەوەكانیانەوە بەچاكترین شێوە پاداشیان بداتەوە
﴿ویزیدهم من فضله﴾ وە لەفەزڵی خۆی بۆیان زیاد كا،واتە: لەونیعمەتانەی كە ئەمان نایزانن و تەنها خوا خۆی ئەیزانێ بەهرەمەندیان بكا ﴿والله یرزق من یشاء بغیر حساب﴾ وەخوا بە هەركەسێك خۆی بییەوێ وحەزبكا, ڕۆزی بێ ژمارەی ئەداتێ.. چونكە ئەوان لەدونیادا زۆرخۆیان ماندوودەكرد بۆ ئەو، بۆیە ئەمیش ئەمڕۆ بێ ئەندازە پاداشتیان ئەداتەوە.

الجزء الثامن عشر — سورة النور

رِجَالٌ لَّا تُلْهِيهِمْ تِجَارَةٌ وَلَا بَيْعٌ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَإِقَامِ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءِ
ٱلزَّكَوٰةِ يَخَافُونَ يَوْمًا تَتَقَلَّبُ فِيهِ ٱلْقُلُوبُ وَٱلْأَبْصَـٰرُ ﴿٣٧﴾
لِيَجْزِيَهُمُ ٱللَّهُ أَحْسَنَ مَا عَمِلُوا۟ وَيَزِيدَهُم مِّن فَضْلِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ يَرْزُقُ
مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٣٨﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَعْمَـٰلُهُمْ كَسَرَابٍۭ
بِقِيعَةٍ يَحْسَبُهُ ٱلظَّمْـَٔانُ مَآءً حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَهُۥ لَمْ يَجِدْهُ شَيْـًٔا
وَوَجَدَ ٱللَّهَ عِندَهُۥ فَوَفَّىٰهُ حِسَابَهُۥ ۗ وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿٣٩﴾
أَوْ كَظُلُمَـٰتٍ فِى بَحْرٍ لُّجِّىٍّ يَغْشَىٰهُ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِۦ مَوْجٌ مِّن
فَوْقِهِۦ سَحَابٌ ۚ ظُلُمَـٰتٌۢ بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْضٍ إِذَآ أَخْرَجَ يَدَهُۥ لَمْ
يَكَدْ يَرَىٰهَا ۗ وَمَن لَّمْ يَجْعَلِ ٱللَّهُ لَهُۥ نُورًا فَمَا لَهُۥ مِن نُّورٍ ﴿٤٠﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ
ٱللَّهَ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلطَّيْرُ صَـٰٓفَّـٰتٍ ۖ كُلٌّ قَدْ
عَلِمَ صَلَاتَهُۥ وَتَسْبِيحَهُۥ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِمَا يَفْعَلُونَ ﴿٤١﴾ وَلِلَّهِ مُلْكُ
ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿٤٢﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُزْجِى
سَحَابًا ثُمَّ يُؤَلِّفُ بَيْنَهُۥ ثُمَّ يَجْعَلُهُۥ رُكَامًا فَتَرَى ٱلْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ
خِلَـٰلِهِۦ وَيُنَزِّلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن جِبَالٍ فِيهَا مِنۢ بَرَدٍ فَيُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ
وَيَصْرِفُهُۥ عَن مَّن يَشَآءُ ۖ يَكَادُ سَنَا بَرْقِهِۦ يَذْهَبُ بِٱلْأَبْصَـٰرِ ﴿٤٣﴾

٣٥٥

لەفەزڵ و گەورەیی مزگەوتدا,ئیمامی (بوخاریی) و، ئیمامی (موسلیم) ڕیوایەتیان كەپێشەوا (عوسمان) گوتویەتی: گوێم لە پێغەمبەر بوو ﷺ دەیفەرموو:((من بنی لله مسجدا یبتغی به وجه الله بنی الله له مثله فی الجنة)) واتە: هەر كەسێك لە بەرخوا مزگەوتێك بكاتەوە، مەبەستیشی هەر ڕەزامەندیی وخۆشنوودیی ئەوبێت، بێگومانە كە خوای دلۆڤانیش نموونەی ئەومزگەوتە- لە گەورەیی وبچوكییدا- كۆشكێكی دەداتێ لە نێو بەهەشتدا.

ئیمامی (موسلیم)یش لە (ئەبوو بورد)ەوە ئەڵێ: پیاوێك لەمزگەوتدا هاواری بۆ شتێكی گومبووی خۆی ئەكرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((لا وجدت، إنما بنیت المساجد لما بنیت له)) واتە:یاخوا نەكەوێتەوە دەستت، ئەی مەگەر نازانی مزگەوتەكان تەنها بۆ خواپەرستی بیناكراون! وە لەفەرموودەیەكی (متفق علیه)دا هاتووە: ((إذا مر احد بسهام ان یقبض علی نصالها، لئلا یؤذی الناس)) واتە: هەرگا كەسێك بیەوێ بەناومزگەوتدا تێپەڕێ "یابمێنێتەوە" تفەنگ و چەكیشی پێ بوو، دەبا باشباشێ تیرەكەی مەحكەم بكاو، (مەترسی دەرچونی نەهێڵێت) تاخەڵكی ئازار نەدات.

**دوو مەسەل بۆ حاشاكەران لە دین:**

﴿[٣٩] والذین كفروا أعمالهم كسراب بقیعة﴾ كاتێ خوای گەورە باسی حاڵی بڕوادارانی كرد، ئێستا دێتە سەر باسێكی بێ بڕوایانیش، وەك ئەفەرموێ: ئەوانەی خوا نەناس و بێ بڕوا بوون، كردەوەكانیان- كە لەدونیادا

دەیانکردن– وەك سەراب و تراویلکەیەك وایە لەدوورەوە لەدەشتێکی کاکی بەکاکیی وبیاباندا لە گەرمای نیوەڕۆدا بریسکە بداتەوە ﴿یحسبە الظمآن ماء﴾ مرۆڤی تینوو لەدوورەوە وادەزانێت ئاوە ﴿حتى إذا جاءە﴾ هەتا کاتێ دەگاتە لای ﴿لم یجدە شیئا﴾ هیچ شتێکی دەست ناکەوێ, نە ئاوو, نە تەڕی ئاو ﴿ووجد الله عندە فوفاه حسابە﴾ وە ئەوەندە دەزانێ خوا لە لای ئامادەیە و، بەپێی کاروکردەوەکانی, حسابی بە تێرو تەسەل بۆ دەکات, واتە: کەلە قیامەت بە خوا دەگات, ئاوا خوا دەبینێ حیسابی بۆ تەواو کردووە ﴿والله سریع الحساب﴾ خواش حیسابکێشی بەچەسپانە. لە فەرموودەیەکی (متفق علیه)دا هاتووە: لەڕۆژی قیامەتدا بەجوولەکەکان ئەوترێ: ئێوە لەدونیادا چیتان دەپەرست؟ ئەوانیش ئەڵێن: (عوزەیر)مان دەپەرست! پێیان ئەوترێ: درۆ ئەکەن، چونکە خوا منداڵی بۆ خۆی نەگرتووە. دیسان پێیان ئەوترێ: ئەی ئێستا داوای چی ئەکەن؟ ئەڵێن: ئەی پەروەردگاری ئێمە! زۆر تینوومانە، تێراومان بکە، لەپاشا پێیان ئەوترێ: سەیر بکەن ئایا نابینن؟ ئینجا ئاگرێك وەك تراویلکە ئەهێنرێتە بەردەمیان و لەتووڕەییدا خۆی دەخواتەوە، ئەوانیش بەناچاری بەرەو ڕووی دەچن و دەکەونە نیویەوە. ﴿[٤٠] او کظلمات فی بحر لجی﴾ یا خود کاروکردەوەیان وەك چەند تاریکییەکە لە ناو دەریایەکی قووڵ وبێ پەیدا ﴿یغشاە موج من فوقە موج﴾ شەپۆل لە سەر شەپۆل دایپۆشێ ﴿من فوقە سحاب﴾ لەژووری ئەویشەوە هەورێکی ڕەشی بارانزاوی چڕوپڕ بێ ﴿ظلمات بعضها فوق بعض﴾ ئیتر چەندتاریکییەك هەندێکی لە سەرووی هەندێکیەوە.

﴿إذا أخرج یدە لم یکد یراه﴾ هەرکە بیەوێ دەستی خۆی بێنێتە دەرێ ,لەوانەیە دەستی خۆی نەبینێ! لەبەر ئەو هەموو تاریکیانە، تاریکی دەریاکە، تاریکی شەپۆلەکان, تاریکی هەورەکە، ئەمانە هەموو ﴿ومن لم یجعل الله لە نورا﴾ وە هەر کەسێ کە خوا خۆی ڕێنموونی نەکاو نوورو ڕووناکی پێ نەدات ﴿فما لە من نور﴾ هیچ نوورو ڕووناکییەکی نیە ڕێی پێدەر بکات، ئەوەش نموونەی دڵی هەمووکافرێکە، کە نەزانێ بۆچی بەدیهێنراوەو, ئەنجامی بۆ کوێیە؟!. (ئیبن عەباس) ئەڵێ: مەبەست بەم ئایەتی: (یغشاه موج من فوقە موج من فوقە سحاب) ئەو پەردەیە کە بەسەر دڵ وگوێی و چاوەکانیاندا هاتووە، وەك ئەفەرموێ: (ختم الله علی قلوبهم وعلی سمعهم وعلی أبصارهم غشاوة..)٧/٢. جاکاتێ خوا دڵی بڕوادارەکانی وەسف کرد بە جێگەی نوورو هیدایەت: (الله نور السموات والأرض), دڵی بێ بڕواکانیشی وەسپکرد بە جێگەی تاریکی و زوڵمەت.

**توانایی خواو باڵا دەستیی:**

جا ئیتر دوای ئەوە چەند بەڵگەیەك بۆ کافران دێنێتەوە، تا بەشکو بڕوا بێنن: ﴿[٤١] الم تر ان الله یسبح لە من فی السموات والأرض﴾ ئایانەتزانیوە ئەیموحەممەد ﷺ! هەرچی و هەرکەس لەئاسمانەکان و لەزەویدان، (فریشتە، جن, ئینسان) لە هەموو عەیب و نەنگێك خوا پاك ڕا ئەگرن؟ هەندێکی بەزمانی وتارو, هەندێکی بە زمان حاڵ ﴿والطیر صافات﴾ وە ئەومەل و پەلەوەرانەش, کە پۆل پۆل بەئاسماندا دەفڕن و باڵیان دەکەنەوە ﴿کل قد علم صلاتە وتسبیحە﴾ هەر یەکەشیان نوێژو تەسبیحی خۆی دەزانێ، بەڵێ هەموو پەلەوەران و گیانلەبەران، وجوود و بوونیان بەو شێوەیە کە هەیە، نیشانەو بەڵگەن لەسەر بوونی خواو تاك وتەنیایی ئەو! ﴿والله علیم بما یفعلون﴾ و خوا لەتەواوی ئەو کردەوانەی ئەوان ئەنجامی ئەدەن زاناو ئاگادارە ﴿[٤٢] ولله ملك السموات والأرض﴾ وە خاوەنێتی ئاسمانەکان و زەویی هەر هەموو بۆخوایە ﴿وإلى الله المصیر﴾ سەرەنجام گەڕانەوەی هەموانیش,هەر بۆلای خوایەو, پاداشت و تۆڵەی هەموو کەسیش ئەداتەوە.

دیسانەوە خوا بەڵگەیەکی تر دێنێتەوە بۆ دەسەڵات و توانایی خۆی، وئەفەرموێ: ﴿[٤٣] الم تر ان الله یزجی سحابا﴾ ئایا تۆ نەتزانیوە کە:خوا بەشێنەیی و لەسەر خۆ پەڵە هەورەکان, دەئاژۆکێ و دەبات بۆ هەرجێگایەك خۆی مەبەستی بێت ﴿ثم یؤلف بینه﴾ پاشان پەیوەستیان دەکاو موتوربە دەبن ﴿ثم یجعله رکاما﴾ ئەوسا چین چین لەسەریەك کەڵەکەیان ئەکا ﴿فتری الودق یخرج من خلاله﴾ ئینجا دەبینی دڵۆپە دڵۆپە باران لەتۆی هەورەکانەوە دێتە خواریٚ ﴿وینزل من السماء من جبال فیها من برد﴾ وەخوا لەو هەورانەوە-کە بە کێو دەچن - هەندیٚ جار تەرزە دەبارێنیٚ.

(ئیبن کەسیر) دەڵیٚ: (قال بعض النحاة: (من) الأولى لإبتداء الغاية، والثاني للتبعيض، فالثالثة لبيان الجنس، ومعناه: أن في السماء جبال برد ينزل الله منها البرد. وأما من جعل الجبال هنا كناية عن السحاب فإن (من) الثانية عنده لإبتداء الغاية، لكنها بدل من الأولى) والله أعلم. ﴿فیصیب به من یشاء﴾ ئینجاهەرکەسیٚ ئەو مەیلی لێبیٚ, تەرزەکە لێیدەدات ﴿ویصرفه عن من یشاء﴾ هەرکەسیش خۆی بیەویٚ لێی نەدا, لێیلادەدا ﴿یکاد سنا برقه یذهب بالأبصار﴾ نزیکە تیشکی بریسکەکەی سۆمای چاویان ببا ﴿[٤٤] یقلب الله اللیل والنهار﴾ بێگومان هەر خوایە شەوو ڕۆژ تاوتویٚ و" ئاڵو گۆڕ ئەکات، جاریٚ درێژ، جارێکیش کورت، دەمیٚ سارد، دەمیٚ گەرم ﴿إن فی ذلك لعبرة لأولی الأبصار﴾ بێگومان لەو ئاڵوگۆڕەشدا پەندو ئامۆژگارییەکی زۆر هەیە بۆ خاوەن بینایی و ئاقڵان، بۆ ئەوانەی وا بەوردیی سەیر ئەکەن و، بەوردیش بیر ئەکەنەوە. یەکێکی تر لەنیشانەکانەی دەسەڵاتی فراوانی زاتی خوا ئەمەیە کە دەفەرموێ: ﴿[٤٥] والله خلق کل دابة من ماء﴾ گشت زیندەوەرو هەموو جووڵندەیەکی لەئاو دروست کردووە، (فریشتە)و (جینی) نەبیٚ، ئەوان لەنوورو ئاگرن. ئینجا ئەفەرموێ: ﴿فمنهم من یمشی علی بطنه﴾ هەیانە لە سەرزگ دەڕوا (وەك مارو هەموو گیاندارێکی خشۆك) ﴿ومنهم من یمشی علی رجلین﴾ هەیشیانە لەسەر دووپیٚ ئەڕۆن (وەك ئادەمزادو مەل و پەلەوەرەکان) ﴿ومنهم من یمشی علی اربع﴾ و لێیانە لەسەر چوار پەلان ئەڕۆن(وەك بزن و مەڕو وشترو..) ﴿یخلق الله ما یشاء﴾ خوا نە هەر ئەوانەی دروست کردبیٚ، بەڵکو هەر شتیٚ حەز لیٚ بکا, بە مەیلی خۆی دروستی ئەکات ﴿إن الله علی کل شئ قدیر﴾ چونکە خوا بەسەر هەموو شتێکدا دەسەڵاتی هەیە, بەکورتیی، ئەو هەموو جۆرە ئاژەڵ و گیانلەبەرانە، کەلەم بوونەوەرەدان، هەموو دەستمان رائەکێشن بۆ باوەڕ هێنان بە خوایەکی بەدەسەڵاتی کار جوان ﴿[٤٦] لقد انزلنا آیات مبینات﴾ بێگومان ئێمە چەند بەڵگەو ئایەتێکی ئاشکراو روونکەرەوەمان ناردە خواریٚ بۆ هیدایەتکردن ﴿والله یهدی من یشاء إلی صراط مستقیم﴾ خوا ڕێنوێنی هەرکەسیٚ ئەکات بۆڕێی ڕاست, خۆی بیەویٚ و شیاویش بێت.

سُورَةُ النُّورِ — الجُزءُ الثامِنَ عَشَرَ

يُقَلِّبُ ٱللَّهُ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبۡرَةٗ لِّأُوْلِي ٱلۡأَبۡصَٰرِ ﴿٤٤﴾
وَٱللَّهُ خَلَقَ كُلَّ دَآبَّةٖ مِّن مَّآءٖۖ فَمِنۡهُم مَّن يَمۡشِي عَلَىٰ بَطۡنِهِۦ وَمِنۡهُم مَّن
يَمۡشِي عَلَىٰ رِجۡلَيۡنِ وَمِنۡهُم مَّن يَمۡشِي عَلَىٰٓ أَرۡبَعٖۚ يَخۡلُقُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُۚ
إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿٤٥﴾ لَّقَدۡ أَنزَلۡنَآ ءَايَٰتٖ مُّبَيِّنَٰتٖۚ
وَٱللَّهُ يَهۡدِي مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٤٦﴾ وَيَقُولُونَ
ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلرَّسُولِ وَأَطَعۡنَا ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٞ مِّنۡهُم مِّنۢ بَعۡدِ
ذَٰلِكَۚ وَمَآ أُوْلَٰٓئِكَ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٤٧﴾ وَإِذَا دُعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ
لِيَحۡكُمَ بَيۡنَهُمۡ إِذَا فَرِيقٞ مِّنۡهُم مُّعۡرِضُونَ ﴿٤٨﴾ وَإِن يَكُن لَّهُمُ ٱلۡحَقُّ
يَأۡتُوٓاْ إِلَيۡهِ مُذۡعِنِينَ ﴿٤٩﴾ أَفِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَمِ ٱرۡتَابُوٓاْ أَمۡ يَخَافُونَ
أَن يَحِيفَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ وَرَسُولُهُۥۚ بَلۡ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٥٠﴾
إِنَّمَا كَانَ قَوۡلَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ إِذَا دُعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحۡكُمَ بَيۡنَهُمۡ
أَن يَقُولُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴿٥١﴾ وَمَن
يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَخۡشَ ٱللَّهَ وَيَتَّقۡهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَآئِزُونَ
﴿٥٢﴾ ۞ وَأَقۡسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهۡدَ أَيۡمَٰنِهِمۡ لَئِنۡ أَمَرۡتَهُمۡ لَيَخۡرُجُنَّۖ قُل
لَّا تُقۡسِمُواْۖ طَاعَةٞ مَّعۡرُوفَةٌۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴿٥٣﴾

قُلْ أَطِيعُوا ٣٥٦

**باوەڕداران و دووڕزییەکان:**

﴿ [٤٧] ویقولون آمنا بالله وبالرسول واطعنا﴾ مونافقەکانیش بەسەر زاری ئەڵێن: ئێمەش بڕوامان بە خواو بەپەیامبەر هێناوە و گوێڕایەڵیشیمان کردووە ﴿ثم یتولی فریق منهم من بعد ذلك﴾ کەچی هەر دوای ئەوە دەستەیەکیان, لەبڕیارەکانی‌خوا ڕوو وەر ئەچەرخێنن و ڕازی نابن! ﴿وما اولئك بالمؤمنین﴾ ئەوانە لە بنەڕەتدا بڕوادار نین, بەڵکو تەنها بەدەم بڕوایان هێناوەو ئەڵێن گوێڕایەڵین ﴿ [٤٨] وإذا دعوا إلى الله ورسوله لیحکم بینهم﴾ کاتێکیش بانگ بکرێن بۆلای بڕیارەکانی خواو پەیامبەرەکەی ئەو, تا لەنێوانیاندا داوەری بکەن ﴿إذا فریق منهم معرضون﴾ کەچی دەستەیەکیان , کت وپڕ ڕوو وەر ئەگێڕن و ئامادە نابن ﴿ [٤٩] وإن یکن لهم الحق یأتوا إلیه مذعنین﴾ وە ئەگەر سوور بزانن ,ئەو سوود وقازانجە بۆ ئەوان دەبێ و, بەوان دەدرێ, بەپەلە دێنە لای و ملکەچی ئەبن و, ڕازی دەبن بەبڕیاری پەیامبەر ﷺ ﴿ [٥٠] افی قلوبهم مرض ام آرتابوا﴾ مەگەر نەخۆشی نیفاق و دووڕوویی لە دڵیاندا هەیە، یاخود دوو دڵ و بەگومانن , سەبارەت بەپەیامبەرێتی موحەممەد ﷺ ﴿ام یخافون أن یحیف الله علیهم ورسوله﴾ یاخود ئەترسن – لەکاتی بڕیارەکاندا – خواو پەیامبەرەکەی ﷺ ستەم وناهەقییەکیان لێ بکەن؟ بۆیە ئاوا گوێڕایەڵ نابن؟!! ﴿بل اولئك هم الظالمون﴾ نا.. بەڵکو ئەوان لەبنەڕەتا خۆیان ستەمکارن , دڵیان نەخۆشە، ئەگینا چاك ئەزانن کە پەیامبەر زۆر دادپەروەروو دادگەرە ﴿ [٥١] إنما کان قول المؤمنین إذا دعوا إلى الله ورسوله لیحکم بینهم﴾ ئەوە حاڵی دوو ڕووەکان بوو, بەڵام وتەو گوفتاری بڕوادارەکانیش کاتێ بانگ دەکرێن بۆلای خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بۆ ئەوەی لەنێوانیاندا داوەری بکا ﴿أن یقولوا سمعنا واطعنا﴾ هەر ئەمەیە کە ئەڵێن: ئەوا بیستمان و گوێڕایەڵیشین. واتە: ئەگەر ئەوانیش بڕوادار بوونایە، دەبوو هەر ئاوایان بووتایە ﴿واولئك هم المفلحون﴾ ئائەوانە – کە بۆ ڕەزامەندی خوا پەلە ئەکەن– سەرفرازی ڕاستەقینەی دونیاو قیامەتن ﴿ [٥٢] ومن یطع الله ورسوله﴾ هەرکەسێ گوێڕایەڵی خواو پەیامبەرەکەی بکا ﴿ویخش الله ویتقه﴾ و لەخوا بترسێت، لەبەر ئەو درێغییانەی کە کردوویەتی, وە لەسەرپێچیش خۆی بپارێزێ , ﴿فأولئك هم الفائزون﴾ ئا ئەوانەن سەرکەوت و براوەن. بۆ جارێکی تر دێتەوە سەر باسی دووڕووەکان و دەفەرموێ:﴿ [٥٣] واقسموا بالله جهد ایمانهم﴾ وەبەوپەڕی هێز سوێندیان بەخوا دەخوارد ﴿لئن امرتهم لیخرجن﴾ ئەگەر تۆ فەرمانیان پێ بکەیت بە دەرچوون بۆ جیهاد" ئەوا زوو لەگەڵت دەر ئەچن ﴿قل لا تقسموا طاعة معروفة﴾ پێیان بڵێ: سوێند مەخۆن, چونکە سوێندەکانتان درۆیە, گوێڕایەڵی و ملکەچی ئێوەش, شتێکی دیارەو زانراوە، ئاشکرایە کە ئەوەی ئێوە دەیڵێن تەنها بەزمانە، نەك بەدڵ ﴿إن الله خبیر بما تعملون﴾ بەڕاستیی خوا بەئاگایە بە هەموو کارو کردەوەکانتان , چ نهێنیی و، چ ئاشکرایی ﴿ [٥٤] قل اطیعوا الله واطیعوا الرسول﴾ پێیان بڵێ: گوێڕایەڵی ڕاستەقینەی خواو گوێڕایەڵی پەیامبەر ﷺ بکەن، نەك وەك خۆتان ئەیڵێن,کەچی واش نیە ﴿فإن تولوا فإنما علیه ما حمل﴾ خۆ ئەگەر ڕوویان وەرگێڕا و ڕاستیان نەوت، ئەوە بەڕاستیی زیانتان هەر بەخۆتان گەیاندووە، چونکە ئەو پەیامبەرە ﷺ تەنها ئەرکی ڕاگەیاندنی پەیامی خوای لەسەرە ﴿وعلیکم ما حملتم﴾ ئێوەش بەرپرسی ئەرکی سەرشانی خۆتان دەبن و، تۆڵەی یاخیبوونتان و. سەرپێچیتان لە گوێڕایەڵیی و فەرمانبەرداریی پێغەمبەر– وەك (ئیبن عەباس) ئەڵێ– لە سەر خۆتان دەکەوێ ﴿وإن تطیعوه تهتدوا﴾ خۆ ئەگەر فەرمانبەردارو گوێڕایەڵی ئەو بن ئەوا ڕێنوێن و بەختیار ئەبن ﴿وما على الرسول إلا البلاغ المبین﴾ دڵنیاشبن کە پێغەمبەر ﷺ تەنها ڕاگەیاندنی ئاشکراو ڕوونی لەسەر شانە، ئیتر ئەگەر ئێوە سەرپێچی لەو بکەن، ئەوا ئەو هەرکاری خۆی دەکات، گوناه و تاوان بەتەنها لەسەر ئێوەیە.

**باوەڕداران دەبنە جێنشین:**

خوای میهرەبان جۆرێکی تر لەپاداشی موسڵمانە ملکەچەکان باس ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿٥٥ وعد الله الذين آمنوا منكم وعملوا الصالحات﴾ بێگومان خوا بەو کەسانەتان کە بڕوایان هێناوەو کارە چاك و جوانەکانیان ئەنجامداوە، بەڵێنی دا: ﴿ليستخلفنهم في الأرض﴾ لەم زەمینەدا بییانکا بە جێنشین و، کلیلی دەسەڵاتداری دونیایان تەسلیم بکا ، واتە:بیانکات بە خەلیفەی ڕووی زەویی ﴿كما استخلف الذين من قبلهم﴾ هەروەك چۆن موسڵمانانی پێش ئەوانی کردە جێنشین. کاتێ هاوەڵانی پەیامبەر ﷺ هاتنە مەدینە، عەرەبەکان لێیان زیت بوونەوە، ئەمانیش لەبەر ئەوە نەیانتوانی تەنها ساتێکیش چەکەکانیان دابنێن، لەناو خۆیاندا وتیان: باشە! خۆئێمە بۆ ئەوە باوەڕمان هێناو کۆچمان کرد، ئیتر تەنها لە خوا بترسین، کەچی وا ئێستا وەزعمان ئەوەیە دەیبینین, ئەو جار خوای گەورەش بەو شێوەیە دڵخۆشی کردن، موژدەیشی پێدان بە فەتحی خۆرهەڵات و خۆرئاوای ڕوو زەوی، لە هەمانکاتدا ئەوەیشی بۆ کردن، چونکە بێ وچان پێغەمبەر ﷺ خۆیی و، خەلیفەکانی - دوای خۆی- هەر لە جیهادو لە جم و جووڵدا بوون، وە پێغەمبەر ﷺ لەبەر ڕۆشنایی بەڵێنەکانی خوادا فەرمویەتی: ((إن الله زوى لي الأرض فرأيت مشارقها ومغاربها، وسيبلغ ملك أمتي ما زوي لي منها)) موسلیم. واتە:خوا دەسەڵاتدار زەویی بۆ پێچامەوەو بۆی تۆمارکردم، ئەمنیش تەماشای گش خورهەڵاتیی وخۆرئاواییم کرد، جامزگێنی بێت کە دەسەڵات وهێزی ئوممەتەکەم دەگاتە گشت ئەوشوێنانە. وەلەفەرموودەیەکی دیکەدا-پێشەوا موسلیم هێناویەتی لە (جابیر) دوە- ئەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست, فەرمووی: ((لا يزال أمر الناس ماضيا ما وليهم اثنا عشر رجلا)) لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە: ((الخلافة ثلاثون سنة، ثم تكون ملكا عضوضا)) پێشەوا ئەحمەد.واتە: هەتا ئەودوانزە پیاوە - مەبەستی دوازدە خەلیفەکەیە - سەرپەرەشتی کارو فەرمانی خەڵکی بکەن، ئەوا ئیش وکاری مەردوم بەچاکی دەڕوا. ﴿وليمكنن لهم دينهم الذى ارتضى لهم﴾ ئەودین و ئایینەش خوا خۆی بۆی پەسەند کردوون، ریشەدارو سەقامگیر و سابت و دامەزراو دەکا بۆیان ﴿وليبدلنهم من بعد خوفهم امنا﴾ وە ترس و بیمەکەشیان بۆ دەگۆڕێ بە ئارامیی‌و ئاسوودەیی ﴿يعبدونني لا يشركون بي شيئا﴾ ئیتر ئەو کاتە تەنها من بپەرستن و هیچ شتێکش نەکەنە هاوبەشم ﴿ومن كفر بعد ذلك﴾ ئەوسا هەرکەسێکیش - پاش ئەوە-کافر بوو, واتە: پاش هاتنە دی بەڵێنەکە ﴿فأولئك هم الفاسقون﴾ ئائەوانەن فاسیق ودەرچووڵەسنووری شەرع ﴿٥٦ واقيموا الصلاة وآتوا الزكاة﴾ (ئەی ئیمانداران!) نوێژی کامڵ بکەن و، بەشێك لە دارایيتان بەناوی زەکاتەوە بدەن ﴿واطيعوا الرسول﴾ وەلە پەیامبەریش ﷺ فەمانبەرداریی‌و گوێرایەڵی بکەن ﴿لعلكم ترحمون﴾ تابەشکو بەر ڕەحمەت و بەر

الجزء الثامن عشر — سورة النور

قُلۡ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَۖ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّمَا عَلَيۡهِ مَا حُمِّلَ
وَعَلَيۡكُم مَّا حُمِّلۡتُمۡۖ وَإِن تُطِيعُوهُ تَهۡتَدُواْۚ وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ
إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ٥٤ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَعَمِلُواْ
ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسۡتَخۡلِفَنَّهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ كَمَا ٱسۡتَخۡلَفَ
ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمۡ دِينَهُمُ ٱلَّذِي ٱرۡتَضَىٰ لَهُمۡ
وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعۡدِ خَوۡفِهِمۡ أَمۡنٗاۚ يَعۡبُدُونَنِي لَا يُشۡرِكُونَ بِي
شَيۡـٔٗاۚ وَمَن كَفَرَ بَعۡدَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ٥٥
وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمۡ
تُرۡحَمُونَ ٥٦ لَا تَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مُعۡجِزِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ
وَمَأۡوَىٰهُمُ ٱلنَّارُۖ وَلَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ٥٧ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ
لِيَسۡتَـٔۡذِنكُمُ ٱلَّذِينَ مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡ وَٱلَّذِينَ لَمۡ يَبۡلُغُواْ ٱلۡحُلُمَ مِنكُمۡ
ثَلَٰثَ مَرَّٰتٖۚ مِّن قَبۡلِ صَلَوٰةِ ٱلۡفَجۡرِ وَحِينَ تَضَعُونَ ثِيَابَكُم مِّنَ ٱلظَّهِيرَةِ
وَمِنۢ بَعۡدِ صَلَوٰةِ ٱلۡعِشَآءِۚ ثَلَٰثُ عَوۡرَٰتٖ لَّكُمۡۚ لَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ
وَلَا عَلَيۡهِمۡ جُنَاحُۢ بَعۡدَهُنَّۚ طَوَّٰفُونَ عَلَيۡكُم بَعۡضُكُمۡ عَلَىٰ
بَعۡضٖۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ٥٨

٣٥٧

سۆزی خوا بکەون. ئینجا ئەنجامی بێ بروایان ئەبڕێتەوەو ئەفەرموێ: ﴿٥٧ لا تحسبن الذين كفروا معجزين فى الأرض﴾ پێت وانەبێ ئەوانەی خوا نەناس وبێ بڕوان, دەتوانن کە لە سزای خوا ڕابکەن ودەسەو سانمان بکەن لە زەویداو, نەتوانین تۆڵەیان لێ وەرگرین، نە، شتی وانابێ و، هەر گیزیش لە دەستمان دەرناچن ﴿ومأواهم النار ولبئس المصير﴾ لە دوارۆژیشدا جێگەی ئەوانە ئاگری دۆزەخەو، وای چ جێگایەکی خراپە دۆزەخ.

**خولاّم و کەنیزەو منداڵی نابلوق سێ کات ئیزن دەخوازن :**

لە ئایەتەکانیپێشەوە هەندێ لە شێوەو ئادابی هاتوچۆی بۆ لای یەکتر باس کرد, ئێستایش باسی سەردانی خزم و خوێشان ئەکات بۆلای یەکتر، وەك ئەفەرموێ: ﴿٥٨ يا أيها الذين آمنوا ليستأذنكم الذين ملكت أيمانكم والذين لم يبلغوا الحلم منكم ثلاث مرات﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! باخولاّم وبەندەوکەنیزەکانتان و, ئەوانەش کە هێمان پێ نەگەیشتوون و (باڵغ نەبوون)بەلاّم مەیلی جینسییان هەیە, لە سێ کاتدا مۆڵەت وەرگرن! بۆ هاتنە ناو ژووری تایبەتی‌نووستنی ژن و مێرد ﴿من قبل صلاة الفجر﴾ لە پێش نوێژی بەیانی‌دا" دیارە لەو کاتەدا مرۆڤ خۆی کردووەتەوە بۆ حەوانەوە ﴿وحين تضعون ثيابكم من الظهيرة﴾ دووەم: نیوەڕۆیان،کاتێ جل و بەرگتان دائەنێن بۆ ئیسراحەت ﴿ومن بعد صلاة العشاء﴾ لە پاش نوێژی خەوتنان "کە لەو کاتەشدا خۆتانتان ئامادە کردووە بۆ خەو دیارە ئەم سێ کاتە، کاتی دانانی جل و بەرگی ئیشەو، کاتی حەوانەوە و پشوودانە، بۆیە بە تایبەت ناویان ئەبات ﴿ثلاث عورات لكم﴾کە ئەم سێ کاتە, کاتی تەنیایی ئێوەیە، وەعەورەتی ئێوەی تیادەرکەوێ,کەواتە دەبێ بەندەو کەنیزەو منداڵەکانیشتان ئاگادار بکەن تا لەوسێ کاتەدا بێ مۆڵەت نەیەنە ژوورەوە ﴿ليس عليكم ولا عليهم جناح بعدهن﴾ د وای ئەو سێ کاتە! ئیتر هیچ قەیناکا و گلەیی لە ئێوەش و ئەوانیش ناکرێت ﴿طوافون عليكم بعضكم على بعض﴾ بەیانیان و ئێواران بگەڕێن بەسەرتانا،چونکە زۆر قورسە بۆ هەردوولاتان گش کات ئەوانە هەر داوای مۆڵەت بکەن" ﴿كذلك يبين الله لكم الآيات﴾ هەر ئا بەو شێوەیە خوا ئایەتەکانی قورئان بۆ ئێوە ڕوون ئەکاتەوە ﴿والله عليم حكيم﴾ ئەو خوایەش زۆر زاناو،بە ئاگایە , بەکاری بەندەکانیی دروستکارە.

الجزء الثامن عشر — سورة النور

وَإِذَا بَلَغَ ٱلْأَطْفَٰلُ مِنكُمُ ٱلْحُلُمَ فَلْيَسْتَـْٔذِنُوا۟ كَمَا ٱسْتَـْٔذَنَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٥٩﴾ وَٱلْقَوَٰعِدُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ ٱلَّٰتِى لَا يَرْجُونَ نِكَاحًا فَلَيْسَ عَلَيْهِنَّ جُنَاحٌ أَن يَضَعْنَ ثِيَابَهُنَّ غَيْرَ مُتَبَرِّجَٰتٍۭ بِزِينَةٍ ۖ وَأَن يَسْتَعْفِفْنَ خَيْرٌ لَّهُنَّ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٦٠﴾ لَّيْسَ عَلَى ٱلْأَعْمَىٰ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْمَرِيضِ حَرَجٌ وَلَا عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ أَن تَأْكُلُوا۟ مِنۢ بُيُوتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ ءَابَآئِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أُمَّهَٰتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ إِخْوَٰنِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أَخَوَٰتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أَعْمَٰمِكُمْ أَوْ بُيُوتِ عَمَّٰتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أَخْوَٰلِكُمْ أَوْ بُيُوتِ خَٰلَٰتِكُمْ أَوْ مَا مَلَكْتُم مَّفَاتِحَهُۥٓ أَوْ صَدِيقِكُمْ ۚ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَأْكُلُوا۟ جَمِيعًا أَوْ أَشْتَاتًا ۚ فَإِذَا دَخَلْتُم بُيُوتًا فَسَلِّمُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ تَحِيَّةً مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُبَٰرَكَةً طَيِّبَةً ۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٦١﴾

إنما المؤمنون ٣٥٨

ئینجا حوکمی ئەو منداڵانەش باس ئەکات باڵغ دەبن, ئەفەرموێ: ﴿٥٩ وإذا بلغ الأطفال منكم الحلم﴾ وەهەر کاتێ منداڵەکانتان گەورە بوون و پێگەیشتن، ئەگەر چی بۆ ساڵی باڵغ بوونیش "زانایان قسەی جیاوازیان هەیە: ئایا نیشانەی باڵغ بوون چیەو، ساڵی باڵغ بوون چەندە؟ ﴿فليستأذنوا﴾ بائەوانیش لە هەموو کاتدا مۆڵەت بخوازن ﴿كما استأذن الذين من قبلهم﴾ وەك چۆن ئەو باڵغ و پێگەیشتوانەی پێش ئەمان ,مۆڵەتیان دەخواست ﴿كذلك يبين

الله لكم آياته﴾ هەر ئابەو شێوەیە خوا حوكمەكانی خۆی بۆ ئێوە ڕوون ئەكاتەوە, دە ئێوەش بەباشی وەریان بگرن ﴿والله علیم حكیم﴾ و خوا زۆر زاناو ئاگایە زۆریش كار جوانە. ئینجا خوا باسی حیجاب ئەكات بۆ دوای پیر بوون، پاش ئەوە بۆسەردەمی لاوێتی باسیكرد، وەك ئەفەرموێ: ﴿[٦٠] والقواعد من النساء اللاتی لا یرجون نكاحا﴾ ئەو ژنانەی لەئیش و كار كەوتون" ئوفتادەبوون و لەبەر پیریی‌ەو، نەمانی ئارەزوو بەتەمای شووكردن نین. (سەعیدی كوڕی جوبەیر، قەتادە، زەحاك) ئەڵێن: مەبەست بەوانە، ئەو ژنانەیە (حەیز)یان نەماوەو، تەمای منداڵیشیان بڕاوە. ﴿فلیس علیهن جناح أن یضعن ثیابهن﴾ هیچ گوناهێكیان لەسەر نیە كە هەندێ لە جل و بەرگی سەرەوەیان دابنێن و نەیپۆشن, وەك عەباو چەتفەو كەواو سەڵتە، وە هەروەها ئەگەر بەبەردەم پیاوانیشدا بێن و بڕۆن ﴿غیر متبرجات بزینة﴾ بەڵام نابێ بەرامبەر بەخەڵك زینەت و جوانی خۆیان نیشان بدەن وەك موو و سەروملی و گەردن و سینگ و لاقیان، شتێك نەكەن سەرنجی بێگانە ڕاكێشن ﴿وان یستعففن خیر لهن﴾ خۆ ئەگەر عیففەتیش نیشان بدەن و كەواو سەڵتەو چەتفەوعاباكانیان, هەر دانەنێن و خۆیان داپۆشن وەك ژنێكی لاو, ئەوە چاكترە بۆیان ,چونكە لەبوختان و قسەی ناقۆڵا دوور ئەكەونەوە ﴿والله سمیع علیم﴾ خوا زۆر ژنەوایە، هەمیشەش زانایە ئەزانێ چی لەنێوان ئەوان و پیاوانی نائاشناو بێگانەدا ڕوو دەدات. كەواتە هۆشیاربن! (سەدی) ئەڵێ: بەناوی (موسلیم)ەوە، هاوڕێیەكم هەبوو خوڵامی ژنەكەی حوزەیفەبوو، ڕۆژێ لەبازاڕدا بە دەستی خەناوییەوە دیتم و، لێم پرسی ئەوە چییە؟! وتی: خەنەم لەسەری (مەولا)كەم (خێزانی حوزەیفە)گرتووە، منیش بڕوام نەكرد، وتی: ئەگەر حەز ئەكەی وەرە ئەتبەمەلای خۆی، بەڵێ ڕۆیشتم، سەیر ئەكەم سەلارە ژنێكە، منیش وتم: موسلیم ڕیوایەتێكی وای بۆ گێڕامەوە؟! وتی: بەڵێ، وایە، ڕۆڵەم! چونكە من لەڕیزی ئەو ژنانەدام خوا بەرامبەریان ئەفەرموێ: (والقواعد من النساء اللاتی لا یرجون نكاحا) ئیبن كەسیر.

**خواردن لای ماڵی خزمان:**

﴿[٦١] لیس علی الأعمی حرج ولا علی الأعرج حرج ولا علی المریض حرج ولا علی انفسكم أن تأكلوا من بیوتكم﴾ لەسەركوێر و شەل و نەخۆش وخۆشتان, هیچ تاوانێك نیە كە لەماڵكانی خۆتان وكوڕەكانتان نان بخۆن بێ‌مۆڵەت. موسوڵمانان لەو سەردەمەدا زۆر بەلایانەوە قورس و سەخت بوو لەگەڵ كوێرو نەخۆش و شەل و ئیفلیجدا نان بخۆن، چونكە ئەوان وەك پێویست ناتوانن نان بخۆن، وە یا نابینن بخۆن، جا ئەمانیش لەترسی ئەوە نەوەك ستەمیان لێ بكەن، خۆیانیان لێ دەپاراستن، تا ئایەتی ﴿لیس علی الأعمی..﴾ هات. (موجاهید) ئەڵێ: هەندێ كەس ئەو نەخۆش و نابیناو ئیفلیجانەی دەبردە ماڵی بابی, یان ماڵی برای، یان ماڵی خوشكی،.. ئەوانیش وتیان: لەباتی ماڵی خۆیان بۆ ماڵانی‌ترمان ئەبەن! جا ئەو ئایەتە: (لیس علی الأعمی) تا(ولا علی انفسكم أن تأكلوا من بیوتكم) تا(لیس علیكم جناح أن تأكلوا جمیعا أو أشتاتا) هات و مۆڵەتی پێدان كە لەو جۆرە ماڵانەشدا بخۆن. ﴿أو بیوت آبائكم أو بیوت أمهاتكم﴾ یا لەماڵی باوكتان، یا لە ماڵی دایكتان ﴿أو بیوت إخوانكم﴾ یا لەماڵی براكانتان ﴿أو بیوت اخواتكم﴾ یا لەماڵی خوشكەكانتان ﴿أو بیوت أعمامكم﴾ یالەماڵی مامەكانتان ﴿أو بیوت عماتكم﴾ یان لە ماڵی پورەكانتان (پووری باوكیی) ﴿أو بیوت أخوالكم﴾ یا لەماڵی خاڵەكانتان ﴿أو بیوت خالاتكم﴾ یان لەماڵی پورەكانی "دایكتان", واتە: خواردن لەماڵی ئەوانەدا گوناح نییەو، پێویست بە مۆڵەتدان و، فەرموو ناكا و، بۆتان هەیە بچنە سەر سفرەیان، چونكە مرۆڤ بۆ خزم و كەس و كاری دڵێ كراوەتەوە ﴿أو ما ملكتم مفاتحه﴾ یا ئەو ماڵەی كلیلەكانی لای ئێوەیەو, كراونەتە وەكلیلدار, تا خاوەنەكەی ئەگەڕێتەوە. هاوەڵان كاتی خۆی كە ئەچوون بۆ سەفەرو بۆ جیهاد

گەڵ جار کلیلی خانووەکانیان ئەدا بەبرایەکی دراوسێیان جا ئەمیش پێی وابوو کە هەرگیز نابێ شتێ لەو ماڵە بخوا، ئەوساخوای گەورە فەرمووی: (أوما ملكتم مفاتحه) ﴿او صديقكم﴾ یا لە ماڵی دۆست و برادەرتانا، بەڵام بەو مەرجە بزانن پێی خۆشە، ئەگەرچی لەماڵەوەش نەبێ ﴿ليس عليكم جناح ان تأكلوا جميعا او اشتاتا﴾ هیچ گوناهیشتان ناگات هەموو پێکەوە لەسەر یەك سفرە نان بخۆن" یاخودهەر کەس بە تەنیا بخوا. کاتی خۆی هەندێ لەخێڵەکان لەبەر سەلاری خۆیان، پێیان ناخۆش بوو بە تەنها نان بخۆن، ئەوجا خوا فەرمووی: ئەوە قەیدی نیە.

ئینجا دوای مۆڵەتدان بۆ هاتوچۆ، فەرمووی: ﴿فإذا دخلتم بيوتا فسلموا على انفسكم﴾ هەرکاتیش چوونە ماڵێنیکەوە سلاو لەخۆتان و یەکتری بکەن، چونکە مایەی خۆشەویستیە ﴿تحية من عند الله مباركة طيبة﴾ ئەمە درووديكی پیرۆز و پاکە لە لای خوا ﴿كذلك يبين الله لكم الآيات﴾ ئا بەو شێوەیە خوا ئایەت و ئادابەکانی خۆی ڕوون ئەکاتەوە بۆتان ﴿لعلكم تعقلون﴾ بەشکو تێ بگەن و ئەو ئایەتانە بکەنە بەرنامەی ژیانتان..

**لەکاری بە کۆمەڵدا بێ ئیزن لا مەکەون:**

لەپێشەوە باسی مۆڵەت وەرگرتن لەکاتی هاتوو چۆی ماڵاندا کرا، ئێستاش باسی مۆڵەت وەرگرتن ئەکا لەکاتی گەڕانەوەو هەڵسان، بەتایبەت لەلای پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿[٦٢] إنما المؤمنون الذين آمنوا بالله ورسوله﴾ بڕوادارانی ڕاستەقینە هەر ئەو کەسانەن کە بڕوایان هێناوە بەخواو بەپەیامبەرەکەی ﴿وإذا كانوا معه على امر جامع﴾ وەکاتێ بۆ کارێکی بە کۆمەڵ لەگەڵ پێغەمبەردا بوون، وەك مەشوەرەت بۆ جەنگ و، یا بۆ هەر شتێکی تری گرنگ و پێویست ﴿لم يذهبوا حتى يستأذنوه﴾ بێ مۆڵەت لێ وەرگرتنی بەهیچ جێگایەکدا نەئەڕۆیشتن، دیارە ئەمە ئەوپەڕی هێمای ئەدەب و وێڵەو ڕێز دانانە لەگەڵ سەرکردەدا، مۆڵەت وەرگرتن، هێمای بڕوای تەواوە، بۆیە ئەفەرمووێ: ﴿إن الذين يستأذنونك﴾ بێگومان ئەو کەسانە مۆڵەتت لێ دەخوازن کاتێ ئەڕۆن ﴿اولئك الذين يؤمنون بالله ورسوله﴾ هەر ئەوانەن کە بەڕاستیی بڕوایان بە خواو بەپەیامبەری ئەو هەیە ﴿فإذا إستأذنوك لبعض شأنهم﴾ هەر کاتێکیش هاتن بۆ هەندێ کاری تایبەتی خۆیان مۆڵەتت لێ بخوازن ئەی پەیامبەر ﷺ ﴿فأذن لمن شئت منهم﴾ تۆیش هەرکەسێکیانت ویست لێان مۆڵەتی بدە با بڕوا بۆ ئەونجامدانی ئیشەکەی لە (تەبووك)دا (عومەر) کارێکی تایبەتی خۆی بۆ پێش هات، هەر ئەبوایە بگەڕایەتەوە، جا ئەوەبوو داوای مۆڵەتی لێکردو، ئەویش فەرمووی: بڕۆ خۆ تۆ لەدوو ڕوویان نیت ﴿واستغفر لهم الله﴾ لەخواش داوای لێخۆش بوونیان بۆ بکە سەبارەت بەو شتانە کە ڕوویداوە لێیان ﴿إن الله غفور رحيم﴾ چونکە خوا زۆر لێبوردەیە، زۆریش میهرەبان و دلۆڤانە.

سُورَةُ النُّورِ — الجُزْءُ الثَّامِنَ عَشَرَ

إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَإِذَا كَانُوا۟ مَعَهُۥ
عَلَىٰٓ أَمْرٍ جَامِعٍ لَّمْ يَذْهَبُوا۟ حَتَّىٰ يَسْتَـْٔذِنُوهُ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَـْٔذِنُونَكَ
أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ فَإِذَا ٱسْتَـْٔذَنُوكَ
لِبَعْضِ شَأْنِهِمْ فَأْذَن لِّمَن شِئْتَ مِنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمُ
ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٦٢﴾ لَّا تَجْعَلُوا۟ دُعَآءَ ٱلرَّسُولِ
بَيْنَكُمْ كَدُعَآءِ بَعْضِكُم بَعْضًا قَدْ يَعْلَمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ
يَتَسَلَّلُونَ مِنكُمْ لِوَاذًا فَلْيَحْذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِۦٓ
أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦٣﴾ أَلَآ إِنَّ لِلَّهِ
مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ قَدْ يَعْلَمُ مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ وَيَوْمَ
يُرْجَعُونَ إِلَيْهِ فَيُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا۟ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌۢ ﴿٦٤﴾

سُورَةُ الفُرْقَانِ — ترتيبها ٢٥ — آياتها ٧٧

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

تَبَارَكَ ٱلَّذِى نَزَّلَ ٱلْفُرْقَانَ عَلَىٰ عَبْدِهِۦ لِيَكُونَ لِلْعَـٰلَمِينَ نَذِيرًا
﴿١﴾ ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَمْ
يَكُن لَّهُۥ شَرِيكٌ فِى ٱلْمُلْكِ وَخَلَقَ كُلَّ شَىْءٍ فَقَدَّرَهُۥ تَقْدِيرًا ﴿٢﴾

٣٥٩

**وەك خۆتان بانگ لە پێغەمبەر مەكەن:**

جا پاش ئەوە ڕێزو شەرەفی پەیامبەر ﷺ لەو سوورەتەدا دەركەوت، بۆ جارێكی تر ئەو قەدر زانینە باس ئەكاتەوەو ئەفەرمووێ: ﴿[٦٣] لا تجعلوا دعاء الرسول بينكم كدعاء بعضكم بعضا﴾ ئەی موسڵمانەكان! بانگ كردن لەپەیامبەر ﷺ وەك بانگكردن لەخۆتان دامەنێن یا خود بەناوی خۆیەوە بانگی لێ مەكەن، وەك ئێوە لەیەكتر بانگ ئەكەن، بەڵكو بەو بڵێن: یا (رسول الله، یانبی الله...) ﴿قد يعلم الله الذين يتسللون منكم لواذا﴾ بێگومان خوا ئاگای لەو كەسانە هەیە كە لەپشت یەكتر خۆ ئەشارنەوەو خۆ ئەدەنە پاڵ یەكترو خۆ دەدزنەوە لێتان" وە لە مزگەوت یەكە یەكە خۆیان دەكێشایە دەرەوە، بێ مۆڵەت ﴿فليحذر الذين يخالفون عن أمره﴾ دەبا ئەوانەی سەرپێچی لە فەرمانی پەیامبەر ﷺ ئەكەن، بترسن ﴿أن تصيبهم فتنة﴾ كە سەرەنجام تووشی بەڵاو نەهاتێك ببن ﴿أو يصيبهم عذاب أليم﴾ یا تووشی سزایەكی بەئێش ببن ﴿[٦٤] ألا إن لله مافي السموات والأرض﴾ وشیاربە! بەڕاستیی هەرچی لە ئاسمانەكان و زەویدایە هەر بۆ خوایە ﴿قد يعلم ما أنتم عليه﴾ بێگومان ئەو خوایە ئەزانێ بەوەی ئێستا ئێوە وان لە سەری لە نیفاق و سەرپێچی ﴿ويوم يرجعون إليه فينبئهم بما عملوا﴾ هەم ئەو ڕۆژەش كە ئەگەڕێنرێنەوە لای ئەو، ئاگاداری ئەوهەموو كاروكردەوەیانە دەكات ئەنجامیان داوە، گەورەو بچووك، جا هەر بەپێی ئەوەش تۆڵەو پاداشتیان ئەداتەوە ﴿والله بكل شئ عليم﴾ چونكە خوا بە هەموو شتێك زاناو ئاگایە.

زۆر شوكرانە بژێرم بۆ خوای دەهندەی دڵاوا كە شەرەفمەندی كردم بە نووسینی

تەفسیری ئەم سوورەتی (نوور)ـە.

وصل اللهم على النبى الأمى محمد وعلى آله وصحبه.

*** *** ***

## ٢٥- سوورەتی ( فورقان )ـە

## مەككەییەو ( ٧٧ ) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتە لەپاش سوورەتی (یاسین)ـەوە هاتۆتە خوارێ، ئەمیش هەروەك باوی سوورەتە مەككەییەكانی تر، كاروباری ئیمان وبیروباوەڕ چارەسەر دەكات، لەگەڵ بەرپەرچدانەوەی هەندێ لە رەخنەی موشریكان، سەبارەت بە پەیامەكەی پەیامبەر ﷺ.

**بەكورتیی:** تەوەرەی سوورەتەكە لەم خاڵانەدا دەسوڕێ: ڕاستیی وحەقیانەتی قورئان، دروستیی و واقیعییەتی پەیامەكەی پەیامبەر ﷺ، زیندووبوونەوەو ژینی ئەولاو، پاداشت و تۆڵە، كۆتاییشی بەباسی بڕێ لەوەسف و پەسنەكانی (عبادالرحمن) دێت.

**مەزنایەتی خوا:**

خوای كارزان – كەئەم قورئانەی ناردۆتە خوارێ– لەم چەند ئایەتەدا باسی مەزنیی وبڵندیی خۆی دەكاو دەفەرموێ:﴿بسم الله الرحمن الرحيم *[١] تبارك الذى نزل الفرقان على عبده﴾ بڵندو گەورەیە، پیرۆزو بەپیتە، ئەو خوایەی كە فورقان وجیاكەرەوەی ڕاست لەناڕاستی ناردەسەر بەندەی خۆی موحەممەد ﷺ واتە: قورئان ﴿ليكون للعالمين نذيرا﴾ تابیبێتە هۆی بێداركەرەوەو ترسێنەر بۆجیهانەكانی پەری و ئادەمزاد، لەسزای خوا.

ئینجا خوا -جل جلاله- چوار سیفەتی تایبەتمەندیی خۆی باس دەکات بۆیان ودەفەرموێ: ﴿٢ الذی له ملك السموات والأرض﴾ یەکەم: ئەو زاتەی موڵکایەتیی ودەسەڵاتی گشت ئاسمانەکان و زەویی هەر هی ئەوە ﴿ولم یتخذ ولدا﴾ دووەم: هیچ منداڵێکی بۆخۆی رانەگرتووە, وەك جوولەکەو گاوران پێیان وایەکە: خوا تۆرم و منداڵی هەیە! ﴿ولم یکن له شریك فی الملك﴾ سێیەم: لەمەودای دەسەڵاتیدا، هیچ شەریك و هاوبەشێکی نیە، وەك بت پەرستەکان پێیان وایە کە: شەریك وهاوبەشی هەیە! ﴿وخلق کل شئ فقدره تقدیرا﴾ چوارەم: هەموو شتێکی لەنەبوون و(عەدەم)ەوە دروسکردوو بەدی هێناو, ئەندازەگیری تەواویشی بۆ کرد , بە میزانێکی ورد ﴿٣ واتخذوا من دونه آلهة﴾ کەچی هاوبەشدانەرەکان لەجیاتی ئەوە کەتەنها ئەوتاکەخوایە بپەرستن، هەستان چەند شتێکیان بۆخۆیان هەڵبژاردو کردیانە خوا! ﴿لایخلقون شیئا﴾ کەتوانای دروستکردنی هیچ شتێکیشیان نیە ﴿وهم یخلقون﴾ وبۆخۆشیان - ئەوبتانە- تاشراوو دروستکراون، وێنەیان بۆکێشراوە ﴿ولایملکون لأنفسهم ضرا ولانفعا﴾ تەنانەتی دەسەڵاتی ئەوەشیان نیە هیچ زیان و سوودێك بەخۆیشیان بگەیەنن ﴿ولایملکون موتا ولاحیاتا ولانشورا﴾ ودەسەڵاتی مردن و ژیان و زیندوو بوونەوەشیان نیە، جا شتێك ئاوابێت، چۆن ئەبێتە خوا؟! چۆن ئێوە ملیان بۆ کەچ دەکەن؟!

الجزء الثامن عشر — سورة الفرقان

وَاتَّخَذُوا مِن دُونِهِ آلِهَةً لَّا يَخْلُقُونَ شَيْئًا وَهُمْ يُخْلَقُونَ
وَلَا يَمْلِكُونَ لِأَنفُسِهِمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا وَلَا يَمْلِكُونَ مَوْتًا
وَلَا حَيَاةً وَلَا نُشُورًا ﴿٣﴾ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا إِنْ هَٰذَا إِلَّا إِفْكٌ
افْتَرَاهُ وَأَعَانَهُ عَلَيْهِ قَوْمٌ آخَرُونَ ۖ فَقَدْ جَاءُوا ظُلْمًا وَزُورًا
﴿٤﴾ وَقَالُوا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ اكْتَتَبَهَا فَهِيَ تُمْلَىٰ
عَلَيْهِ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٥﴾ قُلْ أَنزَلَهُ الَّذِي يَعْلَمُ السِّرَّ
فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۚ إِنَّهُ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٦﴾ وَقَالُوا
مَالِ هَٰذَا الرَّسُولِ يَأْكُلُ الطَّعَامَ وَيَمْشِي فِي الْأَسْوَاقِ ۙ
لَوْلَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مَلَكٌ فَيَكُونَ مَعَهُ نَذِيرًا ﴿٧﴾ أَوْ يُلْقَىٰ
إِلَيْهِ كَنزٌ أَوْ تَكُونُ لَهُ جَنَّةٌ يَأْكُلُ مِنْهَا ۚ وَقَالَ
الظَّالِمُونَ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا رَجُلًا مَّسْحُورًا ﴿٨﴾ انظُرْ
كَيْفَ ضَرَبُوا لَكَ الْأَمْثَالَ فَضَلُّوا فَلَا يَسْتَطِيعُونَ
سَبِيلًا ﴿٩﴾ تَبَارَكَ الَّذِي إِن شَاءَ جَعَلَ لَكَ خَيْرًا مِّن ذَٰلِكَ
جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ وَيَجْعَل لَّكَ قُصُورًا ﴿١٠﴾ بَلْ
كَذَّبُوا بِالسَّاعَةِ ۖ وَأَعْتَدْنَا لِمَن كَذَّبَ بِالسَّاعَةِ سَعِيرًا ﴿١١﴾

إذا رأتهم ٣٦٠

## خوانەناسان گێل و نەزانن:

ئەر سەیری راو بۆچوونی کافران لەبارەی قورئانەوە بکرێ، دەر دەکەوێ کە چەندە گێل و گەوجن، بۆیە خوای گەورە لەوبارەوە دەفەرموێ: ﴿٤ وقال الذین کفروا﴾ وە ئەو کافروبێباوەڕانەدەربارەی قورئان گوتیان: ﴿إن هذا إلا إفك افتراه﴾ ئەم قورئانە هەر درۆیەو، موحەممەد ﷺ خۆی هەڵیبەستووە ﴿وأعانه علیه قوم آخرون﴾ و کەسانی تریش -وەك خاوەن نامەکان- بۆ هۆنینەوەو رێکخستنی یارمەتییان داوە ئینجا خوا رەدیان ئەداتەوەو ئەفەرموێ: ﴿فقد جاؤ ظلما وزورا﴾ بەڕاستیی هەرچییەکیان گوت، بوختانەو ستەمێکی گەورەش دەکەن، چۆن ئەودرۆو پڕوپاڵانتەیە بەرامبەر بە پەیامبەر ﷺ ئەکەن، خۆئەو رووبەڕوویان وەستاو وتی: دەئەگەر دەتوانن تەنها سوورەتێکی بچووکیش بێت بیهێنن، ئەوانیش تەواوی رەوانبێژوخۆشخوانەکانیان بۆئەو مەبەستە کۆبوونەوەو، پەکیان کەوت، دەسا ئەگەر بیانتوانایە نەیان دەکرد؟.

## دەڵێن قورئان چیرۆکی پێشینانە:

﴿٥ وقالوا أساطیر الأولین﴾ گوتیان ئەم قورئانە هەموو ئەفسانەو وتەی باتڵ و پڕوو پووچی پێشینانە ﴿اکتتبها﴾ ئەوان بۆی رێنووس دەکەن وەك داستانی: رۆستەم، ئیسفەندیار.. ﴿فهی تملی علیه بکرة وأصیلا﴾ کە

هەموو بەیانی وئێوارانێك بۆی ئەخوێننەوەو ئەویش لەبەری ئەكات ﴿٦ قل انزله الذی یعلم السر فی السموات والأرض﴾ خوا فەرمانی پێ ئەكات كە رەدیان بداتەوەو ئەفەرموێ: ئەی پێغەمبەر! ﷺ بڵێ: وانیە ئێوە ئەیڵێن! بەڵكو هەرئەوزاتە ناردوویەتی كە بە هەموو نهێنیەكانی ئاسمان و زەویی ئەزانێ و ئاگاداره , هەربۆیە ئێوەش چەندە هەوڵتاندا نەتانتوانی وەك تەنها سوورەتێكی بچكۆلەشی بێنن ﴿إنه كان غفورا رحیما﴾ بێگومان ئەویش (خوا) لەگوناح زۆر لێبوردەیە، زۆردڵاوایە بۆیە ئێستا لەدونیادا سزاتان نادات.

## رەخنە لە پێغەمبەر دەگرن:

بەڵێ تا ئێستا خوانەناسەكان رەخنەیان لە قورئان دەگرت، كەچی وا رەخنە لەپەیامبەر ﷺ خۆیشی ئەگرن: ﴿٧ وقالوا ما لهذا الرسول یأكل الطعام﴾ خوانەناس وكافران گوتیان: بۆئەوچی لەئێمە زیاترە، وا داوای پەیامبەرێتی ئەكات؟ وای ئەمە چ پەیامبەرێكە، خۆراك دەخوا ﴿ویمشی فی الأسواق﴾ وبەبازاڕیشدا دەگەڕێ؟ كەوایە فریشتە نیە، چوون فریشتە خۆراك ناخوات، دیارە پاشایش نیە، چونكە پاشا بەبازاڕدا ناگەڕێ، پێیان وابوو پێغەمبەر دەبێ حاڵ و وەزعی لەوان جیاواز بێت! ﴿لولا انزل إلیه ملك فیكون معه نذیرا﴾ ئەی بۆچی فریشتەیەكی لەگەڵ نەهات لەلایەن خواوە تا بەهاوڕێیەتی ئەوخەڵك بترسێنن ئەگەر راست ئەكا پێغەمبەرە؟ ﴿٨ أو یلقی إلیه كنز﴾ یان گەنجینەیەكی لەئاسمانەوە بۆفڕێ نەدرایە خوارێ، تاخۆی پێ ژیاندباو، و پێویستیشی بەكردوكۆشش نەبووبا؟ ﴿أو تكون له جنة یأكل منها﴾ یان باخێكی هەبوایە تالەدەرامەتەكەی خواردایە؟! ﴿وقال الظالمون إن تتبعون إلارجلا مسحورا﴾ بتپەرستە ستەمكارەكانیش بە موسڵمانەكانیان گوت: ئێوە هەرشوێن پیاوێكی جادوو لێكراوو سەر لێتێكچووكەوتوون؟

ئینجا خوا دڵخۆشی پەیامبەر ﷺ ئەداتەوەو، ئەفەرموێ: ﴿٩ انظر كیف ضربوا لك الأمثال فضلوا﴾ دە بنوارەوسەرنج بدە لەوستەمكارانە چۆن نەزیلەوومەسەلیان بۆهێنایتەوە، هەرجارەی بیانووی شتێ ئەگرن، جابەوهۆیەوە گومڕاو سەرلێشێواوولاڕێ بوون ﴿فلا یستطیعون سبیلا﴾ ئیتر هەرچی دەكەن ناتوانن رێگەیەك بدۆزنەوە بۆ دەربازبوون لەوگومڕاییە ﴿١٠ تبارك الذی إن شاء جعل لك خیرا من ذلك﴾ پیرۆزیی و گەورایەتی، هەر بۆخوایەك، كە ئەوەندە بەدەسەڵاتە ئەگەر ویستی لەوەی ئەوان وتیان, چاك ترت ئەداتێ ﴿جنات تجری من تحتها الأنهار﴾ باخ و باخاتێكت پێدەبەخشێت,جۆگە ئاوەكان بە ژێریاندا دەڕۆن ﴿ویجعل لك قصورا﴾ ودەتكا بە خاوەنیچەندكۆشكێك, وەك هی پاشاكان. ﴿١١ بل كذبوا بالساعة﴾ نا، ئەوانە هیچ هۆیەك نیە بۆنكوڵی وململانێیان، ئەوە نەبێت كە هەر رۆژیی قیامەتیان بەدرۆ دانا ﴿واعتدنا لمن كذب بالساعة سعیرا﴾ ئێمەش ئاگرێكی سووتێنەری بڵێسەدارمان ئامادە كردووە بۆهەركەسێ قیامەت بە درۆدادەنێ ﴿١٢ إذا راتهم من مكان بعید﴾ كاتێ لەشوێنێكی دوورەوە ئەو ئاگرەیە خوا نەناسان دەبینێ ﴿سمعوا لها تغیظا وزفیرا﴾ دەنگێكی ڕقاوی ومرقنی لێ دەبیستن. ئەڵێیت دەنگی پرمەی وڵاخە.(ئیبن عەباس) ئەڵێ: ئەو كەسەی وابۆ جەهەننەم رادەكێشرێ , جەهەننەم بۆی دەپرمێنێ, وەكو ئێستر بۆ(جۆ)دەپرمێنێ ﴿١٣ وإذا القوا منها مكانا ضیقا مقرنین﴾ هەركاتێكیش بەدەست و پێ كۆت و زنجیر كراوەوە دەخرێنە ناو جێگایەكی تەسك و تەنگەبەرلەدۆزەخدا، ﴿دعوا هنالك ثبورا﴾ ئەوسابەپەلە هاواری تیا چوون و ماڵ وێرانی و داوای مەرگ دەكەن و بەر دەبنە بانگ و سەڵای حەسرەت و هەناسە ساردی ﴿١٤ لا تدعوا الیوم ثبورا واحدا﴾ ئەوسا پێیان ئەوترێ: ئەمڕۆ ئیتر هەریەك جار داوای مەرگی خۆتان مەكەن: ﴿وادعوا ثبورا كثیرا﴾ بەڵكو زۆرو بێ شمار هاوارو واوەیلا وداوای مردن بكەن.

**بەهەشت چاکە، یان دۆزەخ؟:**

﴿[١٥] **قل أذلك خير أم جنة الخلد التى وعد المتقون**﴾ جا بۆ ئەوەی زیاتر ئێشیان پێ بگا خوا ئەفەرموێ: پێیان بڵێ: ئاخۆ ئەو حاڵەی کافرانە چاکترە، یا ئەم بەهەشتە هەتا هەتاییە کە بەڵێنی بەخواناسان و پارێزگارانی سنوورەکانی خوا دراوە؟! ﴿**كانت لهم جزاء ومصيرا**﴾ کەلەدوارۆژدا هەم پاداشتی کارەکانیانەو، هەم جێ وشوێنی گەرانەوەشیانە ﴿[١٦] **لهم فيها ما يشاؤن خالدين**﴾ چییان بۆی لەوێ دەستیان ئەکەوێت و بۆیان ئامادەیە، بە هەتا هەتاییش تێیدا ئەمێننەوە ﴿**كان على ربك وعدا مسؤلا**﴾ ئەوەش بەڵێنێکە لەلایەن پەروەردگارتەوە هەر دەبێ بێتەدی و" خواش خۆی کردووە بەرپرسیار لێی.

**قیامەت هاتن بتان لە بتپەرستان حاشا دەکەن:**

﴿[١٧] **ويوم يحشرهم وما يعبدون من دون الله**﴾ وە بۆ ئامۆژگاریان باسی ئەو رۆژە بکە هەم خۆیان و، هەم ئەوانەی -بێجگە لەخوا (الله)- ئەیانپەرستن، خوا لەجێیەك کۆیان ئەکاتەوە، (موجاهید) ئەڵێ: مەبەست لەوپەرستراوانە عیساو عوزەیرو فریشتەکانە ﴿**فيقول أانتم اضللتم عبادى هؤلاء**﴾ جا ئەڵێت: ئاخۆ ئێوە بوون ئەم بەندانەی منتان گومڕا کردو، بانگتان کردن بۆ پەرستنی خۆتان؟! ﴿**أم هم ضلوا السبيل**﴾ یاخود ئەوان خۆیان ڕێیان گوم کردو گومڕا بوون و ئێوەشیان پەرست؟ ﴿[١٨] **قالوا سبحانك**﴾ ئەوانیش- بەسەر سوڕمانێکەوە- ئەڵێن: خوایە! لەهەموو شەریك و هاوەڵێك تۆ بێ نیازو پاکیت" خۆیشت چاك ئەزانیت هەرگیز ئێمە شتی وامان نەکردووە. وەك لە (٣٤/٤٠-٤١)دا ئەفەرمووێ: (ويوم نحشرهم جميعا ثم نقول للملائكة أهؤلاء إياكم كانوا يعبدون قالوا سبحانك أنت ولينا من دونهم بل كانوا يعبدون الجن اكثرهم به مؤمنون). ﴿**ماكان ينبغى لنا أن نتخذ من دونك من أولياء**﴾ هەرگیز شیاوو ڕەوا نیە بۆئێمە لەباتی تۆ دۆستێکی تر بگرین و، بیپەرستین و خەڵکیشیان بۆلا بانگ بکەین ﴿**ولكن متعتهم وآباءهم حتى نسوا الذكر**﴾ بەڵام تۆخۆت ئەی خوایە! ئەوان و باو باپیرانیانت ئەوەندە بەهرەوەرو و تەمەن درێژ کرد، هەموو جۆرێ نازو نیعمەت و ڕۆزیت پێدان، ئیتر شوکرو ڕووکردنە تۆیان بە پەرستن بە تەنیا لە بیر کرد ﴿**وكانوا قوما بورا**﴾ سەرەنجام تیا چوون وبوونە قەومێکی وا بێ خێر ﴿[١٩] **فقد كذبوكم بما تقولون**﴾ ئینجا بەپەرسشەکان ئەوترێ: بەڕاستیی پەرستراوەکان قسەکانی ئێوەیان بەدرۆخستنەوە کە گوایا ئەوان ئێوەیان گومڕا کردبێ، خۆ ئێستا وا دەر نەچوو. ﴿**فما تستطيعون صرفا ولا نصرا**﴾ ئینجا چی ئەکەن؟ خۆ ئێستا هیچ دەسەڵاتێکتان نیەو ناتوانن نە سزا لەخۆتان لا بدەن و، نەیارمەتی لە کەسێك وەرگرن ﴿**ومن يظلم منكم نذقه عذابا كبيرا**﴾ و

سُورَةُ الفُرْقَانِ — الجُزْءُ الثَّامِنَ عَشَرَ

إِذَا رَأَتْهُم مِّن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ سَمِعُوا۟ لَهَا تَغَيُّظًا وَزَفِيرًا ﴿١٢﴾ وَإِذَآ
أُلْقُوا۟ مِنْهَا مَكَانًا ضَيِّقًا مُّقَرَّنِينَ دَعَوْا۟ هُنَالِكَ ثُبُورًا ﴿١٣﴾
لَّا تَدْعُوا۟ ٱلْيَوْمَ ثُبُورًا وَٰحِدًا وَٱدْعُوا۟ ثُبُورًا كَثِيرًا ﴿١٤﴾ قُلْ
أَذَٰلِكَ خَيْرٌ أَمْ جَنَّةُ ٱلْخُلْدِ ٱلَّتِى وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ كَانَتْ
لَهُمْ جَزَآءً وَمَصِيرًا ﴿١٥﴾ لَّهُمْ فِيهَا مَا يَشَآءُونَ خَٰلِدِينَ
كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ وَعْدًا مَّسْـُٔولًا ﴿١٦﴾ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ وَمَا
يَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَيَقُولُ ءَأَنتُمْ أَضْلَلْتُمْ عِبَادِى
هَٰٓؤُلَآءِ أَمْ هُمْ ضَلُّوا۟ ٱلسَّبِيلَ ﴿١٧﴾ قَالُوا۟ سُبْحَٰنَكَ مَا كَانَ
يَنۢبَغِى لَنَآ أَن نَّتَّخِذَ مِن دُونِكَ مِنْ أَوْلِيَآءَ وَلَٰكِن مَّتَّعْتَهُمْ
وَءَابَآءَهُمْ حَتَّىٰ نَسُوا۟ ٱلذِّكْرَ وَكَانُوا۟ قَوْمًۢا بُورًا ﴿١٨﴾ فَقَدْ
كَذَّبُوكُم بِمَا تَقُولُونَ فَمَا تَسْتَطِيعُونَ صَرْفًا وَلَا
نَصْرًا وَمَن يَظْلِم مِّنكُمْ نُذِقْهُ عَذَابًا كَبِيرًا ﴿١٩﴾
وَمَآ أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ إِلَّآ إِنَّهُمْ لَيَأْكُلُونَ
ٱلطَّعَامَ وَيَمْشُونَ فِى ٱلْأَسْوَاقِ وَجَعَلْنَا بَعْضَكُمْ
لِبَعْضٍ فِتْنَةً أَتَصْبِرُونَ وَكَانَ رَبُّكَ بَصِيرًا ﴿٢٠﴾

٣٦١

هەرکەسیشتان "ئەی بێ بڕوایان!" شیرك وستەم بکا و خەڵکی بانگ بکات بۆ دواکەوتنی غەیری خواو بۆ بەرنامەو پڕۆگرامی تر، ئەوە لەدواڕۆژدا ئێمە سزایەکی گەورەی پێ ئەچێژین.

**گشت پێغەمبەرێك ئادەمزاد بووە:**

﴿[20] وما أرسلنا قبلك من المرسلين﴾ ئێمە بەرلەتۆش ئەی پێغەمبەر ﷺ هەرپەیامبەرێکمان نارد بێت ﴿إلا أنهم ليأكلون الطعام ويمشون في الأسواق﴾ خواردنیان دەخواردو بە بازاڕیشدا دەڕۆشتن ﴿وجعلنا بعضكم لبعض فتنة﴾ لەهەمانکاتدا هەندێکیشتانمان کردۆتە هۆی تاقیکردنەوە بۆ هەندێکی ترتان، بڕێ پەیامبەرە، بڕێ دەوڵەمەندە، بازێ پاشایە ﴿أتصبرون﴾ ئاخۆئێوە خۆتان ڕادەگرن؟ ﴿وكان ربك بصيرا﴾ بێگومان پەروەردگارت هەمیشە بینایە، و ئەزانێ کێ خۆی ڕائەگرێ و، سوپاسی ئەکات، کێش خۆی ڕاناگرێ وسپڵە ئەبێت. پێشەوا (موسلیم) ئەم فەرموودە ئەهێنێ: ((انظر إلى من أسفل منكم، ولا تنظروا إلى من هو فوقكم، فإنه أجدر ألا تزدروا نعمة الله عليكم)). واتە: ئێوە هەمیشە تەماشای لای خوارووی خۆتان بکەن.واتە: قەت سەیری لای سەرووی خۆتان مەکەن، کاری ئاوا دەبێتە هۆی ئەوە کەئێوە بەکەم نەڕواننە نیعمەتەکانی خوا.

کۆتایی جزمی هەژدەیەم

ولله الحمد والمنة

*** *** ***

**سەرسەختی خوا نەناسان:**

﴿[21] وقال الذين لا يرجون لقاءنا﴾ ئەوانەی ئومێدیان بەرووبەڕووبوونەوەو گەیشتن بەدیداری ئێمە نیە و، نکووڵی زیندووبوونەوە ئەکەن ,گوتیان: ﴿لولا انزل علينا الملائكة﴾ بۆچی فریشتە دانەبەزێنرایە لامان و پێمان بڵێن: موحەممەد وقورئانەکەی هەردوو ڕاستن؟ ﴿أو نرى ربنا﴾ یان بۆ پەروەردگاری خۆمانمان بەچاونەدی؟ تاڕاستیی پەیامبەرمان پێ بڵێت ﴿لقد استكبروا في انفسهم﴾ بێگومان ئەوانە گرفتاری دەردی لەخۆبایی بوون و، خۆیان زۆربەگەورە زانی ﴿وعتوا عتوا كبيرا﴾ و ئێجگاریش نافەرمانییانکردوسەرکەشیەکی گەورەیان کرد ﴿[22] يوم يرون الملائكة لا بشرى يومئذ للمجرمين﴾ ئەو ڕۆژەش فریشتەکان دێن بۆ گیان کێشانیان، بەچاوی خۆیان دەیانبینن کە هیچ جۆرە موژدەو مزگێنیەکیان پێ نیە بۆیان ﴿ويقولون حجرا محجورا﴾ و پێیان ئەڵێن:چوونە بەهەشت وموژدەی لێخۆشبوون, بۆ ئێوە قەدەغە یەو" هەرگیز شتیوا نابیسن ﴿[23] وقدمنا إلى ما عملوا من عمل﴾ هاتین هەرکارێکیان کردبوو (وەك سەردانی خزم و کەس وکارو هەرچاکەیەکی تر) ﴿فجعلناه هباء منثورا﴾ هەموویمان وەك تۆزو گەردی بڵاوە پێکراوی بەربا پێکرد، واتە: هیچ سوودێکی نەبوو بۆیان ﴿[24] أصحاب الجنة يومئذ خير مستقرا﴾جێگەی بەهەشتییەکانیش زۆرباشە ﴿وأحسن

الجزء التاسع عشر　　سورة الفرقان

۞ وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرۡجُونَ لِقَآءَنَا لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡنَا ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ أَوۡ نَرَىٰ رَبَّنَاۗ لَقَدِ ٱسۡتَكۡبَرُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ وَعَتَوۡ عُتُوّٗا كَبِيرٗا ﴿٢١﴾ يَوۡمَ يَرَوۡنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ لَا بُشۡرَىٰ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُجۡرِمِينَ وَيَقُولُونَ حِجۡرٗا مَّحۡجُورٗا ﴿٢٢﴾ وَقَدِمۡنَآ إِلَىٰ مَا عَمِلُواْ مِنۡ عَمَلٖ فَجَعَلۡنَٰهُ هَبَآءٗ مَّنثُورًا ﴿٢٣﴾ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِ يَوۡمَئِذٍ خَيۡرٞ مُّسۡتَقَرّٗا وَأَحۡسَنُ مَقِيلٗا ﴿٢٤﴾ وَيَوۡمَ تَشَقَّقُ ٱلسَّمَآءُ بِٱلۡغَمَٰمِ وَنُزِّلَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ تَنزِيلًا ﴿٢٥﴾ ٱلۡمُلۡكُ يَوۡمَئِذٍ ٱلۡحَقُّ لِلرَّحۡمَٰنِۚ وَكَانَ يَوۡمًا عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ عَسِيرٗا ﴿٢٦﴾ وَيَوۡمَ يَعَضُّ ٱلظَّالِمُ عَلَىٰ يَدَيۡهِ يَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي ٱتَّخَذۡتُ مَعَ ٱلرَّسُولِ سَبِيلٗا ﴿٢٧﴾ يَٰوَيۡلَتَىٰ لَيۡتَنِي لَمۡ أَتَّخِذۡ فُلَانًا خَلِيلٗا ﴿٢٨﴾ لَّقَدۡ أَضَلَّنِي عَنِ ٱلذِّكۡرِ بَعۡدَ إِذۡ جَآءَنِيۗ وَكَانَ ٱلشَّيۡطَٰنُ لِلۡإِنسَٰنِ خَذُولٗا ﴿٢٩﴾ وَقَالَ ٱلرَّسُولُ يَٰرَبِّ إِنَّ قَوۡمِي ٱتَّخَذُواْ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ مَهۡجُورٗا ﴿٣٠﴾ وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوّٗا مِّنَ ٱلۡمُجۡرِمِينَۗ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ هَادِيٗا وَنَصِيرٗا ﴿٣١﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوۡلَا نُزِّلَ عَلَيۡهِ ٱلۡقُرۡءَانُ جُمۡلَةٗ وَٰحِدَةٗۚ كَذَٰلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِۦ فُؤَادَكَۖ وَرَتَّلۡنَٰهُ تَرۡتِيلٗا ﴿٣٢﴾

ولا يأتونك　　٣٦٢

مقيلا﴾ و جێگای حەوانەوەی نیوەڕۆژیشتان زۆر باشترە، چونکە ئەوکاتە، کاتی پشوودانە ﴿[٢٥] ويوم تشقق السماء بالغمام﴾ ئاسمان بەهۆی دەرکەوتنی هەورێك دەقەڵەشێ و شەقار شەقار دەبێ.(ئیبن کەسیر) ئەڵێ: (وهو - الغمام- ظل النور العظيم الذي يبهر الأبصار). واتە: مەبەست بە (غەمام)، ئەوهەورەیە: سێبەری ئەو نوورێکی گەورەیەو چاوەکان ئەبەزێنن، وەك ئەفەرموێ: (هل ينظرون إلا أن يأتيهم الله في ظلل من الغمام والملائكة وقضي الأمر وإلى الله ترجع الأمور)٢/٢١٠.

مەبەست پێی هاتنی زاتی خوایە-جل جلالە- سێبەرەکەش، سێبەری زاتی خۆیەتی، (خوایش بۆخۆی باشتر ئەزانێ). جاکە ئەو ڕۆژە هات, ئیتر تەواوی خۆرەکان وئەستێرە گەڕۆکەکان، وەك تۆزێکی پرژو بلاویان لێ دێ و، دڵەکانیش هەموو لە هەیبەتا تروسکاییان تیا نامێنێ ﴿ونزل الملائكه تنزيلا﴾ فریشتەکانیش -بەنامەی کارو کردەوەی ئەوانەوە- پۆل پۆل ودەستە دەستە، دادەبەزێنرێن بۆسەر زەوی بۆحیساب ولێپرسینەوە ﴿[٢٦] الملك يومئذ الحق للرحمن﴾ لەو ڕۆژەدا فەرمانڕەوایی و دەسەڵاتی تەواوو ڕاستەقینە , هەر بۆخوای دەهندەی بەبەزەییە، کەسێکی تر هیچ دەسەڵاتێکی نیە ﴿وكان يوما على الكافرين عسيرا﴾ بێگومان بۆکافرانیش ئەو ڕۆژە, ڕۆژێکی پڕ تەنگانەو سەخت ودژوارە، چونکە ڕۆژی دەرکەوتنی کارو کردەوەی ڕاست و ناڕاستە. بەڵام بۆموسڵمانان لە ئەنجامدانی نوێژێکی فەرز ئاسانترە، وەك (سەعیدی خودری) ئەڵێ: بەپێغەمبەریان ﷺ وت: (يوم كان مقداره خمسين الف سنة) دەبێ ئەو ڕۆژە چەندە سەخت و درێژ بێ؟ فەرمووی: ((والذي نفس محمد بيده يخفف على المؤمن حتى يكون أخف عليه من صلاة مكتوبة يصليها في الدنيا)) مسند الامام أحمد ٣/٧٥.

### ستەمکار ڕۆژی سەلا دەستی خۆی دەگەزێ:

﴿[٢٧] ويوم يعض الظالم على يديه﴾ لەو ڕۆژەدا ناهەقکاروستەمکار -لە حەسرەت وپەشیمانی ئەوە کە لەدونیادا گوێڕایەڵی پەیامبەر نەبوو -بە هەردوودەستی خۆیدادەنووسێ ﴿يقول ياليتني اتخذت مع الرسول سبيلا﴾ و ئەڵێ: ئەی خۆزگە! منیش لەگەڵ پەیامبەردا ڕێگەی ئیمانم دەگرتە بەر ﴿[٢٨] يا ويلتى ليتني لم أتخذ فلانا خليلا﴾ ئەی تیاچوونی خۆم, خۆزگە! فلانەکەسی گومڕاکەرم نەکردبا بە دۆستیخۆم ﴿[٢٩] لقد اضلني عن الذكر بعد إذجاءني﴾ چونکە بەڕاستیی لە ئاستی ئەم قورئانە منی گومڕاوویڵکردو سەری لێ تێکدام، پاش ئەوەی ڕێبازی ڕاستیم بۆ هات ﴿وكان الشيطان للإنسان خذولا﴾ بێگومان شەیتان هەمیشە و بەردەوام بۆ مرۆڤ شەرمەزارکەرو ناپشتگیر بووە، لەڕێگەی ڕاست لایداوەو، بەرەو هەڵدێر بردوویەتی.

### پێغەمبەر سکاڵای قەومەکەی دەکات:

بێ بڕوایان و خوانەناسان هەردەم تانەو تەشەرێکی زۆریان لە قورئان ئەداو گوێیان بۆ نەدەگرت، پەیامبەریش زۆربەوە نارەحەت دەبوو، بۆیە سکالادەباتە لای پەروەردگاریەو, قورئانیش ئەفەرموێ: ﴿[٣٠] وقال الرسول يا رب إن قومي اتخذوا هذا القرآن مهجورا﴾ پێغەمبەرگوتی:ئەیپەروەردگاری من! بێگومان-وەك خۆت ئاگاداریی- قەوم و هۆزەکەم وازیان لەم قورئانە هێناو پشتگوێیان خست و بەدوایا نەچوون و لێی دوور کەوتنەوە!! خوایش دڵی پەیامبەر ﷺ ئەداتەوەو، ئەفەرموێ: ﴿[٣١] وكذلك جعلنا لكل نبي عدوا من المجرمين﴾ هەرئابەو شێوەیە تۆ دوژمنایەتی دەکرێیت بۆهەرپێغەمبەرێکیش دوژمن وملۆزمێکمان - لەتاوانباران- داناوەو ڕاستکردۆتەوە، لەکاتی خۆیدا ئەزیەتی کردووە، ڕێگەی پێگرتووە ﴿وكفى بربك هاديا ونصيرا﴾ وە بەسە پەروەردگارت ڕێنوێن ویاریدەدەرت بێت , وە لەداهاتووشدابەسەردوژمناندا سەرت دەخاودەتگەیەنێتە مەبەستی بەرزی خۆت.

## بۆچی ئەم قورئانە پێکرا نەنێردرا؟!:

خوای باڵادەست بروبیانوویەکی تریان بۆ پێغەمبەر باس ئەکاو ئەفەرموێ: ﴿[٣٢] وقال الذين كفروا لولا نزل عليه القرآن جملة واحدة﴾ خوانەناس وبێ باوەڕان گوتیان: بۆچی قورئانی بەیەکجار بۆنایەت! "هەروەك تەورات و ئینجیل، پێکرا بۆ موساو عیسا هاتن؟ دیارە ئەمەیشیان هەر درۆیە، چونکە تەورات لە ماوەی (١٨) ساڵدا ئەوجا بەتەواوی هاتووەو, لاریەکی دیکەشیانە لەقورئان، جاخوا بۆچوونەکەیان رەت ئەکاتەوەو ئەفەرموێ: ﴿كذلك لنثبت به فؤادك﴾ هەرئابەو جۆرەیە -بەیناو بەین و کەم کەم، وەلەماوەی (٢٣) ساڵدا ئەم قورئانەمان دابەزاند بۆت- تادڵی تۆی زیاتر پێ بەهێز و قایم بکەین ﴿ورتلناه ترتيلا﴾ وبە رێك وپێکیوهێدی هێدی, بۆتمان خوێندەوە لەسەر زمانی جبریل.

خوا ئەیەوێت پتر پەیامبەر دڵ ئەستوور بکات، بۆیە ئەفەرموێ: ﴿[٣٣] ولا يأتونك بمثل إلا جئناك بالحق واحسن تفسيرا﴾ ئەوکافرو موشریکانە هەرمەسەل ونەزیلەیەکت بۆ دێننەوە, بۆ وەستانی کارەکەت و ناشرین کردنیئەم قورئانە, ئێمەیش بەردەوام بەوەڵامی هەق و بەجێ وجوانترین تەفسیرێکەوە هاتوین بەهاناتەوە. ئینجا حاڵی بێ بڕواکان باس ئەکاو ئەفەرموێ: ﴿[٣٤] الذين يحشرون على وجوههم إلى جهنم﴾ ئەو تاوانبارانەی لە سەر ڕوخساریان دەبرێن بۆدۆزەخ ولەوێ کۆدەکرێنەوە ﴿اولئك شرمكانا واضل سبيلا﴾ ئائەوانە خراپترین خەڵکن بەجێگە، وە لەهەموو کەسێ گومبووترین خەڵکیشن بە ڕێگە, واتە: لەرووی جێگاو شوێنەوە, خراپترین خەڵکن لە جەحەنەمدا, وەلە رووی ڕێگاو ڕێبازیشەوە,گومراترینی خەڵکن (ئەنەس) ئەڵێ: پیاوێك بەپێغەمبەری ﷺ وت: کافر چۆن بەسەر روو ودەم وچاودا حەشر ئەکرێ؟! فەرمووی: ((إن الذى امشاه على رجليه قادر أن يمشيه على وجهه يوم القيامة)) متفق عليه. بەڕاستی ئەوکەسەی کەدەتوانێ بەسەر هەردوو پێدا بەڕێوەی ببا، هەرئەو زاتەش دەتوانێ لەڕۆژی قیامەتدا بەسەر روخساریا بەڕێوەی ببا.



وَلَا يَأْتُونَكَ بِمَثَلٍ إِلَّا جِئْنَٰكَ بِٱلْحَقِّ وَأَحْسَنَ تَفْسِيرًا (٣٣)
ٱلَّذِينَ يُحْشَرُونَ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ أُو۟لَٰٓئِكَ شَرٌّ
مَّكَانًا وَأَضَلُّ سَبِيلًا (٣٤) وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ
وَجَعَلْنَا مَعَهُۥٓ أَخَاهُ هَٰرُونَ وَزِيرًا (٣٥) فَقُلْنَا ٱذْهَبَآ إِلَى
ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا فَدَمَّرْنَٰهُمْ تَدْمِيرًا (٣٦) وَقَوْمَ
نُوحٍ لَّمَّا كَذَّبُوا۟ ٱلرُّسُلَ أَغْرَقْنَٰهُمْ وَجَعَلْنَٰهُمْ لِلنَّاسِ
ءَايَةً وَأَعْتَدْنَا لِلظَّٰلِمِينَ عَذَابًا أَلِيمًا (٣٧) وَعَادًا وَثَمُودَا۟
وَأَصْحَٰبَ ٱلرَّسِّ وَقُرُونًۢا بَيْنَ ذَٰلِكَ كَثِيرًا (٣٨) وَكُلًّا ضَرَبْنَا
لَهُ ٱلْأَمْثَٰلَ وَكُلًّا تَبَّرْنَا تَتْبِيرًا (٣٩) وَلَقَدْ أَتَوْا۟ عَلَى ٱلْقَرْيَةِ
ٱلَّتِىٓ أُمْطِرَتْ مَطَرَ ٱلسَّوْءِ أَفَلَمْ يَكُونُوا۟ يَرَوْنَهَا بَلْ
كَانُوا۟ لَا يَرْجُونَ نُشُورًا (٤٠) وَإِذَا رَأَوْكَ إِن يَتَّخِذُونَكَ
إِلَّا هُزُوًا أَهَٰذَا ٱلَّذِى بَعَثَ ٱللَّهُ رَسُولًا (٤١) إِن كَادَ
لَيُضِلُّنَا عَنْ ءَالِهَتِنَا لَوْلَآ أَن صَبَرْنَا عَلَيْهَا وَسَوْفَ
يَعْلَمُونَ حِينَ يَرَوْنَ ٱلْعَذَابَ مَنْ أَضَلُّ سَبِيلًا (٤٢) أَرَءَيْتَ
مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ أَفَأَنتَ تَكُونُ عَلَيْهِ وَكِيلًا (٤٣)



## خوا قورەیش هوشیار دەکاتەوە:

جا بۆدڵدانەوەی پێغەمبەر ﷺ داستانی هەندێ لەپەیامبەران باس ئەکاو ئەفەرموێ: ﴿[٣٥] ولقد آتينا موسى الكتاب﴾ بێگومان ئێمە تەوراتیشمان بەمووسادا ﴿وجعلنا معه أخاه هارون وزيرا﴾ هاروونی برایشیمان کردە وەزیری لەکارو باریدا ﴿[٣٦] فقلنا آذهبا إلى القوم الذين كذبوا بآياتنا﴾ ئینجا پێمان وتن: بچن بۆلای ئەوهۆزوگەلە کەبەڵگەو نیشانەکانی ئێمەیان بەدرۆ دادەنا ﴿فدمرناهم تدميرا﴾ ئینجا ئێمەیش- لەتۆڵەی ئەوەدا- زۆر بەتوندی تێکمان شکاندن ولەناومان بردن ,کەواتە تۆش ئەی پەیامبەر ﷺ! لە قورەیش بێتاقەت مەبە، چونکە ئەم جۆرە

کارانە دوژمنیان زۆرە، وئەنجامیشیان هەر ئاوایە ﴿[٣٧] وقوم نوح لما كذبوا الرسل﴾ وەهۆزو گەلی (نووح)یش کاتیٚ پەیامبەرەکانیان بەدرۆخستەوە (بەدرۆخستنەوەی تەنها پێغەمبەرێکیش، وەکو بەدرۆخستنەوەی هەموو پێغەمبەرانە، بۆیە بە کۆ فەرمووی(الرسل) ﴿اغرقناهم وجعلناهم للناس آية﴾ لەناوتۆفانەکەدا نقوممان کردن و وکردیشمانن بەپەندوعیبرەت بۆخەڵکی ﴿واعتدنا للظالمين عذابا اليما﴾ وە سزایەکی دەرداویشمان ئامادەکردووە بۆستەمکارەکان لەقورەیش و لە خەڵکانی تر ﴿[٣٨] وعادا وثمود وأصحاب الرس﴾ وەگەلی عاد و سەموودی (گەلی صالح) و، خاوەنی چاڵ و بیرەکانیشمان هەریەکەیان بەجۆرە سزایەکی شیاو بەتاوانەکەی لەناو برد. (اصحاب الرس) لە (یەمامە) دائەنیشتن. (ئیبن عەبباس) دەڵیٚ: (رەس) گوندێك بوو لە گوندەکانی (سەموود). (عیکرەمە)ش دەڵیٚ: (اصحاب الرس) لە (فەلەج)بوون و، هاوەڵ و ئوممەتی (یاسین)بوون، (قەتادە) دەڵیٚ: یەکێك بووە لەگوندەکانی (یەمامە) هەندێکیش دەڵێن: (رەس) بیرێکە کە پێغەمبەرەکانیان تیا دەناشت. ﴿وقرونا بين ذلك كثيرا﴾ وە خەڵکانی زۆری خوانەناسی تریشمان لەو نێوانەدا لەناو برد "کاتیٚ لەفەرمانەکانمان سەرپێچیان کرد". ئاخۆ (قەرن) چەند ساڵ بێت؟ هەندیٚ ئەڵێن: (١٢٠) ساڵە، هەندیٚ دی دەڵیٚ: (١٠٠) ساڵە، هی وایش هەیە دەڵیٚ: (٤٠) ساڵە، وهەروەها. بەڵام قسەی ڕۆشن ئەوەیە بە ئوممەتێکی هاوچەرخ دەوتریٚ (قەرن)، جا کە ئەوانە ڕۆیشتن، ئیتر دەستەی پاش ئەوان دەبێتە (قرن)ی دووەم. وە لەفەرموودەیەکی (متفق عليه) داهاتووە: ((خير القرون قرني، ثم الذين يلونهم، ثم الذين يلونهم)). ﴿[٣٩] وكلا ضربنا له الأمثال﴾ بۆهەریەکەیان چەند بەڵگەو نموونەمان هێناوەوبۆمان ڕۆشن کردنەوەو برِوو بیانوومان نەهێشتن ﴿وكلا تبرنا تتبيرا﴾ ئینجاپاش ئەوە بەڵگەکەڵکی نەبوو و هەر پێی ژێر نەبوون، هەموانیانمان ونجڕ بە ونجڕکردو تەفرو تونامان کردن،خانووەکانیانمان کاولکرد بەکاولکردن. جاخوا بەیناوبەین بەسەرهاتی گەلانی پێشوو وەبیری قورەیش دێنێتەوە، بۆیە ئەفەرمویٚ ﴿[٤٠] ولقد أتوا على القرية التى امطرت مطر السوء﴾ وەبێگومان بیٚباوەڕانی قورەیش – لەگەشتەکانی هاوێنیاندا – بە سەرئەوشارەدا(سەدووم) رابووردون، کەبارانی شەرو بەڵامان بۆباراندن. سەدووم: گەورەترین شاری هۆزی لووت بوو. ﴿أفلم يكونوا يرونها﴾ ئایا بەچاویخۆیان ئاسەواری ئەوشارەیان نەدی، تا ژێر بن و ئامۆژگاری پیٚ وەرگرن؟ ﴿بل كانوا لا يرجون نشورا﴾ بەڵکو بەتەمای زیندووبوونەوە نەبوون! ئەگینا بینیویان.

**قورەیش پێغەمبەر دەکەنە گەپجاڕی خۆیان!:**

﴿[٤١] وإذا رأوك إن يتخذونك إلا هزوا﴾ ئەوانەکە تۆ دەبینن ، هیچ ڕێزو پایەیەکت بۆ قایەلنابن، بەڵکو دەتکەنە گاڵتەجارو بەیەکتر دەڵێن: ﴿اهذا الذى بعث الله رسولا﴾ ئا ئەمەیە خوا کردوویە بە پەیامبەرو رەوانەی کردووە؟! ﴿[٤٢] إن كاد ليضلنا عن آلهتنا لولا أن صبرنا عليها﴾ خۆ نزیك بوو لەپەرستنی خواکانمان گومڕامان بکاو سەرمان لیٚ تێکبدا ئەگەر ئێمە خۆڕاگرنەبووینایە لەسەر پەرستنیان ﴿وسوف يعلمون حين يرون العذاب من اضل سبيلا﴾ ئێستا وادەڵێن، وەلەئاییندەدا کاتیٚ کە سزاکە دەبینن، چاك ئەزانن کیٚ گومڕاترو سەرلێشێواوترە؟! ﴿[٤٣] ارايت من اتخذ إلهه هواه﴾ ئایا تۆئەو کەسەت دیتووە کە ئارەزووی خۆی دەکاتەخوای خۆی؟ ئەمڕۆ ئەم ئەپەرستیٚو، سبەینیٚ پشتگیریی، لە یەکێکی تر ئەکات؟ هەر ڕۆژەی لە جێگایەك ئەبینریٚ!! (ئیبن عەبباس) ئەڵیٚ پیاوی وا هەبوو ئەمڕۆ بەردێکی سپی ئەپەرست، کاتیٚ بەردێکی جوانتر لەوی دیتبا، ئەمی دەپەرست و، پشتی لەودەکرد! ﴿افأنت تكون عليه وكيلا﴾ ئاخۆ تۆ دەتەویٚ بریکارو ڕێنوێنکاری ئەو کەسە بی و، نەهێڵی دوای ئارەزووی خۆی بکەوی؟ ﴿[٤٤] ام تحسب ان اكثرهم يسمعون او يعقلون﴾ یا پێت وایە کە زۆربەیان "وتەکانت" بە دڵ ئەبیسن، وبیر لەماناو

مەبەستەکەی ئەکەنەوەو تێدەگەن؟ ﴿إن هم إلا کالأنعام بل هم اضل سبیلا﴾خۆ ئەوانە هەر وەك مالاتن (بزن، مەڕ، وشتر، گا) خاوەنی بیرکردنەوەنین, بەڵکو لەوانەشە گێل و وێڵ تر و نەزانترین , چونکە گەلێ جارئاژەڵ بەگوێی خاوەنەکەی ئەکاو، هەرکەسێکیش چاکەی لەگەڵ بکات لەبیری ناچێت.

**بەڵگەی بوونی خواو، دەسەلات و توانایی:**

جادوای ئەوە کە خوا باسی نەفامیی و سەرلێشێواوی بێ بڕوایانی کرد، ئێستاش پێنج بەڵگەیان بۆدێنێتەوە لەسەر قودرەت وتوانایی خۆی ودەفەرموێ: ﴿[٤٥] الم تر إلی ربك کیف مد الظل﴾ یەکەم: ئاخۆ نەتدیوە ئەی موحەممەد ﷺ! پەروەردگارت -بەدەسەلاتی خۆیی و لەبەر بەرژەوەندی مرۆڤەکان -چۆن سێبەری درێژ کردۆتەوە؟ هەر لەهەڵهاتنی خۆرە وە تا ئاوابوونی؟ تالە گەرمای خۆردا سوودی لێوەربگرن" ﴿ولوشاء لجعله ساکنا﴾ خۆ ئەگەرخۆی بیویستبا،وای‌دەکرد لەجێی خۆی‌نەبزوێ،ئنجا بۆ هەمیشەڕۆژ هەر سێبەر دەبوو، بەلام ئالو گۆڕو ئەم لاوئەولاو پاش وپێش وراست و چەپی پێ ئەکات، تا ئێوە چۆن حەزی لێبکەن سوودی لێ وەرگرن ﴿ثم جعلنا الشمس علیه دلیلا﴾ لەپاشان خۆریشمان کرد بە بەڵگە لەسەری، بەهۆی ئەوەوە گۆڕانکاری لەسێبەردادەبێ‌و سێبەر پەیدا دەبێت، ئەی نابینی بەهەڵهاتنی خۆر سێبەردەرئەکەوی؟ خۆ ئەگەر خۆر نەبووبا سێبەریش نەدەزانرا ﴿[٤٦] ثم قبضناه إلینا قبضا یسیرا﴾ لە پاشا کەمە کەمەو لەسەرخۆ بۆلای خۆمانی‌دەبەینەوە واتە: بەیەك کەرەت لای نابەین، وەلە وەشدا سوودو کەڵکی ئێوەی تێدایە. ڕاڤەکەرانی قورئان ئەڵێن: سێبەر حاڵەتێکی مام ناوەندییە لەنێوان ڕۆشنایی و تاریکییدا، لەکاتی دەرکەوتنی بەیاندا دەست پێ ئەکات تا خۆر هەڵدێت ﴿[٤٧] وهو الذی جعل اللیل لباسا﴾ دووەم: هەر ئەو خوایەیە بە میهرەبانی خۆی شەوی گێراوە بە جل و بەرگ و پۆشاك بۆتان، واتە: بە تاریکییەکەی وەك پۆشاك داتان ئەپۆشێ ﴿والنوم سباتا﴾ وەخەویشمان گێراوە بەمایەی ئیسراحەت و ماتی و ئارامش " ئەوەتەلەش ودەروونتان بەهۆی ئەوەوە ئەحەوێتەوە﴿وجعل النهار نشورا﴾ و ڕۆژیشی کردووە بەهۆی هەستانەوەو جموجوڵ و کارو کۆشش بۆتان ﴿[٤٨] وهوالذی ارسل الریاح بشرا بین یدی رحمته﴾ سێیەم: هەر ئەوخوایەیە (با)یەکانی هەڵکردووەو، ناردووە بەمژدەدان, لەپێش باراندا ﴿وانزلنا من السماء ماء طهورا﴾ وە لەئاسمانەوە ئاوێکی پاك و خاوێنکەرمان ناردەخوار ﴿[٤٩] لنحیی به بلدة میتا﴾ تا شارو ناوچە مردووە کشتوکاڵیەکانی پێ ببوژێنینەوەوبکرێنە مەزراو باخ و باخات ﴿ونسقیه مما خلقنا انعاما واناسی کثیرا﴾ وەماڵات و مەردمێکی زۆر, لەوانەی خۆمان دروستمان کردوون" تێراوبکەین،بەوجۆرەلە شیوو دۆڵەکاندا ئاوەکە ئەوەستێتەوەو، سوودی لێ وەر ئەگیرێ، یان ئاوی دەریاکان و کانییەکان زۆر ئەبن ﴿[٥٠] ولقد صرفناه بینهم

الجزء التاسع عشر — سورة الفرقان

أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ إِنْ هُمْ إِلَّا
كَالْأَنْعَٰمِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلًا ﴿٤٤﴾ أَلَمْ تَرَ إِلَىٰ رَبِّكَ كَيْفَ مَدَّ
الظِّلَّ وَلَوْ شَاءَ لَجَعَلَهُ سَاكِنًا ثُمَّ جَعَلْنَا الشَّمْسَ عَلَيْهِ دَلِيلًا
﴿٤٥﴾ ثُمَّ قَبَضْنَٰهُ إِلَيْنَا قَبْضًا يَسِيرًا ﴿٤٦﴾ وَهُوَ الَّذِي جَعَلَ
لَكُمُ الَّيْلَ لِبَاسًا وَالنَّوْمَ سُبَاتًا وَجَعَلَ النَّهَارَ نُشُورًا ﴿٤٧﴾
وَهُوَ الَّذِي أَرْسَلَ الرِّيَٰحَ بُشْرًا بَيْنَ يَدَيْ رَحْمَتِهِ وَأَنزَلْنَا
مِنَ السَّمَاءِ مَاءً طَهُورًا ﴿٤٨﴾ لِّنُحْيِيَ بِهِ بَلْدَةً مَّيْتًا وَنُسْقِيَهُ
مِمَّا خَلَقْنَا أَنْعَٰمًا وَأَنَاسِيَّ كَثِيرًا ﴿٤٩﴾ وَلَقَدْ صَرَّفْنَٰهُ بَيْنَهُمْ
لِيَذَّكَّرُوا فَأَبَىٰ أَكْثَرُ النَّاسِ إِلَّا كُفُورًا ﴿٥٠﴾ وَلَوْ شِئْنَا
لَبَعَثْنَا فِي كُلِّ قَرْيَةٍ نَّذِيرًا ﴿٥١﴾ فَلَا تُطِعِ الْكَٰفِرِينَ
الحزب ٣٧ وَجَٰهِدْهُم بِهِ جِهَادًا كَبِيرًا ﴿٥٢﴾ ۞ وَهُوَ الَّذِي مَرَجَ
الْبَحْرَيْنِ هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ وَجَعَلَ بَيْنَهُمَا بَرْزَخًا
وَحِجْرًا مَّحْجُورًا ﴿٥٣﴾ وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ مِنَ الْمَاءِ بَشَرًا فَجَعَلَهُ
نَسَبًا وَصِهْرًا وَكَانَ رَبُّكَ قَدِيرًا ﴿٥٤﴾ وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ
مَا لَا يَنفَعُهُمْ وَلَا يَضُرُّهُمْ وَكَانَ الْكَافِرُ عَلَىٰ رَبِّهِ ظَهِيرًا ﴿٥٥﴾

٣٦٤ — وما أرسلناك

لیذکروا﴾ بێگومان ئەم قورئانەمان روونکردەوە لەنێوانیاندا، بۆ ئەوەی ئەوان بیربکەنەوەو سوپاسی خوای لە سەر بکەن ﴿فابی أکثر الناس إلا کفورا﴾ کەچی زۆربەی ئەوخەڵکە نکوڵییان کردو ناسوپاسگوزار بوون!

**موحەممەد ﷺ پێغەمبەری هەمووانە:**

﴿٥١ ولو شئنا لبعثنا فی کل قریة نذیرا﴾ وە ئەگەر ویستبامان بۆ هەر شارو گوندێك پێغەمبەرێکی ترسێنەرمان رەوانە دەکرد، جا ئەو کاتە کاری تۆ ئاسانتر ئەبوو، بەڵام وامان نەکرد، لەبەر رێزلێنانی تۆ، جا کەواتە تۆیش زۆر بەئارامەوە کاربکە بۆ گشتگیرکردنی بەرنامەکەی خوا، وەك خوا خۆی دەفەرموێ: (لأنذرکم به ومن بلغ)(١٩/٦) یادەفەرموێ: (قل یا أیها الناس إنی رسول الله إلیکم جمیعا..) (١٥٨/٧). لە فەرموودەیشدا هاتووە: ((بعثت إلی الأحمر والأسود))(متفق علیه) من رەوانە کراوم بۆلای سوور پێس و رەش پێس، واتە: بۆلای هەمووان، وە هەروەها فەرموویەتی: ((کان النبی یبعث إلی قومه خاصة، وبعثت إلی الناس عامة..)) بوخاریی و موسلیم. هەر پێغەمبەرێك بۆلای هۆزەکەی خۆی بەتایبەتی دەنێردرا، بەڵام من بۆلای هەموو خەڵکانی سەر زەوی نێردراوم و ئاینەکەم گشتگیرە. ﴿٥٢ فلا تطع الکافرین وجاهدهم به جهادا کبیرا﴾ جا کەواتە تۆئەی پێغەمبەر ﷺ! بەردەوامبە لەسەر گەیاندنی پەیامی خۆت و هەرگیز گوێرایەڵی بێبڕوایان مەکە، وە بەم قورئانە (وەك ئیبن عەبباس دەڵێ) بە هەموو هێزو توانایەکت جیهاد و ململانەیەکی گەورەو زۆریان لەگەڵ بکە. وە فەرمایشتی خوا: (یا أیها النبی جاهد الکفار والمنافقین..) (٩/٦٦). پشتگیری ئەو مانایە دەکات. ﴿٥٣ وهوالذی مرج البحرین﴾ <u>چوارەم</u>: خوا هەرئەو زاتەیە - بەمیهرەبانی خۆی- ئاوی دوو دەریا، یا دوو رووباری لەپاڵ یەکدا بەرداوەتەوە ﴿هذا عذب فرات﴾ ئەمەیان خۆش وسازگارە بۆ خواردنەوە دەشێت ﴿وهذا ملح أجاج﴾ ئەمەشیان خوێیەکی سوێرو تاڵە، بۆئەوە دەریاکان بۆگەن نەکەن، چونکە ئەگەر ئاوە سوێرەکان نەبن، وەك دەریای (فارس) دەریای (چین).. گشت دەریاکانیتر تێك دەچن. ﴿وجعل بینهما برزخا وحجرا محجورا﴾ وە لە نێوانیاندا بەربەست و لەمپەرێکی داناوە کەتێکەڵ بەیەك نەبن وئاوی ئەم نەچێ بەسەر ئەویتریاندا، بۆیە هیچ کاتیش یەکتر نافەوتێنن.. هەروەك دەفەرموێ: (مرج البحرین یلتقیان بینهما برزخ لایبغیان) (٥٥/١٩-٢٠). ﴿٥٤ وهوالذی خلق من الماء بشرا﴾ <u>پێنجەم</u>: خوا هەر ئەو زاتەیە کە لەتنۆکە ئاوێ (مەنی) مرۆیەکی ژیرو بیسندەو گۆیاو بینای دروست کرد ﴿فجعله نسبا وصهرا﴾ جا کردییە ماکی تۆرەمەو خزمایەتیی لەرێگەی پیاوەوە کۆمەڵێك خزم دروست دەبێت، هەروەها بەهۆی ژنیشەوە، واتە: توخمی بەشەر دووبەشە: بەشێکیان بە رشتەیەو نێرینەکانی ئەدرێنە پاڵیان، چونکە رشتە بەباوکەوە پاڵ ئەدرێ، ئەوی تریشیان ژن و ژن خواستنە بەهۆی ژن بەیەك دان هۆگری و خۆشەویستی پەیدا ئەبێ دیارە ئەمانەش هەموو هەر لەو تنۆکە ئاوە لاوازەن ﴿وکان ربك قدیرا﴾ وە پەروەردگارت هەمیشە بە توانایەو دەسەڵاتی بێ سنوورە.

**نەزانی و نەفامیی موشریکەکان:**

﴿٥٥ ویعبدون من دون الله ما لا ینفعهم ولا یضرهم﴾ وە لەگەڵ ئەوهەموو بەڵگانەدا لەسەر یەك خوا پەرستی ئەو خوا نەناسانە -لەباتی خوا- شتێ ئەپەرستن نەکەڵکیان پێدەگەیەنێت، نە زیان ﴿وکان الکافر علی ربه ظهیرا﴾ بێ باوەڕ هەمیشە دژ بە پەروەردگاری خۆی بەدوژمنایەتی و بت پەرستی پشتیوانی لەشەیتان دەکات، بەڵام سەرەنجام هەر بەرنامەی خوا زاڵ ئەبێ ﴿٥٦ وما أرسلناك إلا مبشرا ونذیرا﴾ وە ئێمە تۆمان هەر بۆئەوە ناردووە موژدەدەرو ترسێنەر بی ﴿٥٧ قل ما أسئلکم علیه من أجر﴾ بەو خەڵکە بڵێ: من لەبەرامبەر راگەیاندنی پەیامەکەوە هیچ کرێ و پاداشتێکم لەئێوە ناوێ تا بڵێن بۆ دونیا وا دەکات ﴿إلا من شاء أن یتخذ إلی ربه سبیلا﴾ جگە لەوە کێ حەز بکا

بەرەو پەروەردگاری خۆی ڕێ بگرێتە بەر، واتە: من هەر ئەوەم ئەوێ لەئێوە بەرەو خوا بێن، ئیتر نە پارەو پوڵ نە دونیا ﴿٥٨ و توكل على الحى الذى لا يموت﴾ وە لەکارەکانتدا تەنها پشت بەو خوایە ببەستە کە هەمیشە زیندووە و، هەیەو هەرگیز نامرێ ئیتر گوێت لەئەزیەت وئازاری ئەوانەوە نەبێت ﴿وسبح بحمده﴾ بەردەوامیش پاکانەی خواوەندت بکە بە شوکرانە بژێری کردنی، وە لەهەر ناووسیفەتێکی نەشیاوو نەگونجاویش دوور رایبگرە ﴿وكفى به بذنوب عباده خبيرا﴾ وە بەسە بۆخوا کە بەگوناهەکانی بەندەکانی بە ئاگایە، وە بەپێی ئەوانەش تۆڵەو پاداشتیان ئەداتەوە ﴿٥٩ الذى خلق السموات والأرض وما بينهما فى ستة ايام﴾ ئەو خوایەی ئاسمانەکان و زەویی و هەرچی لەنێوانیاندایە لەماوەی شەش ڕۆژدا بەدی هێنا ﴿ثم استوى على العرش﴾ پاشان چووە سەرتەخت و عەرشی فەرمانڕەوایی خۆی -جل جلاله- بەو شێوەیە کە هەر شایستەی زاتی خۆی بێت، وە بەبێ هیچ شوبهاندن ودەست تێوەردانێك، ئێمەیش بڕوامان بەو (استوا) یەی هەیە بەوجۆرە لەقورئان ولە فەرموودەکاندا هاتووەو (سەلەف)یش وەریان گرتووە و مانایان بۆ کردووە ﴿الرحمن﴾ هەرئەوە بە بەزەیی ﴿فاسأل به خبيرا﴾ ساتۆ داواو هاوار هەر لەو زاتە بکە، چونکە هەرئەو بە هەموو شتێك چاك ئاگادارە. دوای باسکردنی ئەوهەموو بەهرانەی خوایە هێشتا ئەوان لەباتی ئەوە سوپاسگوزاری ئەو بکەن، کەچی بەردەوام ناسوپاسی ئەکەن، ئەفەرموێ: ﴿٦٠ وإذا قيل لهم اسجدوا للرحمن﴾ وە ئەگەر بەبت پەرستەکان گوترابا: کە کڕنووش ببەن بۆ خوای بەخشندە و بە بەزەیی و ملکەچی ئەوبن ﴿قالوا وما الرحمن﴾ یاخی دەبوون و دەیانگوت: (ڕەحمان) کێیە؟! ئێمە نایناسین! بۆیە لە (حودەیبیە)شدا (الرحمن الرحيم)یان پێ کوژاندەوەو، کردیانە (باسمك اللهم)..! جاخوایش فەرمووی: (قل ادعوا الله أو ادعوا الرحمن أيا ما تدعوا فله الأسماء الحسنى) (١٧/١١٠). ﴿انسجد لما تأمرنا﴾ ئایا کڕنووش ببەین بۆ ئەوەی فەرمانمان پێدەدەیت؟ لەکاتێکدا ئێمە نایناسین ﴿و زادهم نفورا﴾ وە فەرمان دان بەکڕنووش بردن بۆ (ڕەحمان) دوور کەوتنەوەو سڵ کردنەوەیانی زیاد کرد، واتە: بەوە زیادتر دوور کەوتنەوە.

الجزء التاسع عشر — سورة الفرقان

وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا مُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا ٥٦ قُلۡ مَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ
مِنۡ أَجۡرٍ إِلَّا مَن شَآءَ أَن يَتَّخِذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلٗا ٥٧ وَتَوَكَّلۡ
عَلَى ٱلۡحَيِّ ٱلَّذِي لَا يَمُوتُ وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِهِۦۚ وَكَفَىٰ بِهِۦ بِذُنُوبِ
عِبَادِهِۦ خَبِيرًا ٥٨ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَا
فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۚ ٱلرَّحۡمَٰنُ فَسۡـَٔلۡ بِهِۦ
خَبِيرٗا ٥٩ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱسۡجُدُواْۤ لِلرَّحۡمَٰنِ قَالُواْ وَمَا ٱلرَّحۡمَٰنُ
أَنَسۡجُدُ لِمَا تَأۡمُرُنَا وَزَادَهُمۡ نُفُورٗا ۩ ٦٠ تَبَارَكَ ٱلَّذِي جَعَلَ (سجدة)
فِي ٱلسَّمَآءِ بُرُوجٗا وَجَعَلَ فِيهَا سِرَٰجٗا وَقَمَرٗا مُّنِيرٗا ٦١ وَهُوَ
ٱلَّذِي جَعَلَ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ خِلۡفَةٗ لِّمَنۡ أَرَادَ أَن يَذَّكَّرَ أَوۡ أَرَادَ
شُكُورٗا ٦٢ وَعِبَادُ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمۡشُونَ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ
هَوۡنٗا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلۡجَٰهِلُونَ قَالُواْ سَلَٰمٗا ٦٣ وَٱلَّذِينَ
يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمۡ سُجَّدٗا وَقِيَٰمٗا ٦٤ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ
رَبَّنَا ٱصۡرِفۡ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَۖ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا
٦٥ إِنَّهَا سَآءَتۡ مُسۡتَقَرّٗا وَمُقَامٗا ٦٦ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَنفَقُواْ
لَمۡ يُسۡرِفُواْ وَلَمۡ يَقۡتُرُواْ وَكَانَ بَيۡنَ ذَٰلِكَ قَوَامٗا ٦٧

٣٦٥

## باڵادەستی و توانایی خوا:

﴿٦١ تبارك الذى جعل فى السماء بروجا﴾ بەرز و بڵندە ئەو خوایەی چەندان قوناغی ئەستێرەی گەورە گەورەو شۆڵەداری لە ئاسماندا دامەزراندووە ﴿و جعل فيها سراجا و قمرا منيرا﴾ وە چرایەکی پڕشنگدار (خۆر) و مانگێکی ڕووناکیشی تێدا داناوە بۆ ڕووناکی ڕۆژوو شەو لەزەویدا، وەك دەفەرموێ: (وهو الذى جعل الشمس ضياء والقمر نورا) (١٠/٤) یان دەفەرموێ: (وجعل القمر فيهن نورا وجعل الشمس سراجا)(٧١/١٦) بۆ کەماڵی دەسەڵاتی ئەو خوا

کارجوانە. ﴿[٦٢] وهو الذی جعل اللیل والنهار خلفة﴾ وە ئەو خوایەیە شەوو ڕۆژی جێنشینی یەك کردووە، بەنۆرە لەدوای یەك دێن، ئەمەیان ڕەشەو تاریك، ئەوەشیان ڕووناك و سپی ﴿لمن أراد أن یذکر أو أراد شکورا﴾ بۆ کەسێك بیەوێ لە نیعمەتەکانی خوا بیر بکاتەوەو، یان بییەوێ سوپاسگوزار بێت،

**پەسن و جەزای عەبدەکانی خوای بەبەزەیی:**

ئەوجاپاش ئەوە بەم شێوەیە باسی یازدە سیفەتی بەرزی گرنگی (عبادالرحمن) ئەکات: ﴿[٦٣] وعباد الرحمن الذین یمشون علی الأرض هونا﴾ یەکەم: بەندە ڕاستەکانی خوای بە بەزەیی ئەوانەن کەزۆر بەسەلاریی و نەرمیی و لەسەرخۆو بێ دەعیەو فیز بەسەر زەوییدا دەڕۆنە ڕێوە. وەك ئەفەرموێ: (ولا تمش فی الأرض مرحا) (١٨/٣١). یان ئەم فەرموودەیە: ((إذا اتیتم الصلاة فلا تأتوها وأنتم تسعون...)) هەرکات و یستتان وەر نە نوێژ، بە تالووکەولەز مەیەن (بەڵکو زۆر لە سەرخۆبچنە ڕێوە).دووپاتی ئەی مانایەن.

﴿وإذا خاطبهم الجاهلون قالوا سلاما﴾ دووەم: کاتێکیش نەزانەکان لەڕوویان دەوەستن بەقسەی ناشیرین و نەفامانە ئەوان قسەو وتەی چاك و بێ وەی دەڵێن، واتە: بەوتەی ناشیرین لەڕوویان ناوەستنەوە، وەك ئەفەرمووێ: (وإذا سمعوا اللغو أعرضوا عنه)(٥٥/٢٨). ﴿[٦٤] والذین یبیتون لربهم سجدا وقیاما﴾ سێیەم: ئەوانەن کە شەوگار بە نوێژکردن و سوژدەبردن و بەپێوە وەستان دەبەنەسەر، وەك ئەفەرمووێ: (کانوا قلیلا من اللیل ما یهجعون) (١٧/٥١). ﴿[٦٥] والذین یقولون ربنا اصرف عنا عذاب جهنم﴾ چوارەم: ئەوانەن کە ئەڵێن: ئەی پەروەردگاری هەموومان! سزای ئاگری دۆزەخمان لێ لابدە ﴿إن عذابها کان غراما﴾ چونکە سزای دۆزەخ سزایەکی جیا نەبووەو لە کۆڵ نەکەوتووە ﴿[٦٦] إنها ساءت مستقرا ومقاما﴾ بەڕاستیی ئەو دۆزەخە جێ و شوێنێکی ناسازو خراپە. ﴿[٦٧] والذین إذا أنفقوا لم یسرفوا ولم یقتروا﴾ پێنجەم: ئەوانەن کاتێ ماڵ و سامان ئەبەخشن نە زیادەڕەویی تیا ئەکەن و، نەچرووکی، بەشی خەڵکی لێ ئەدەن و لەشتی ڕەوادا سەرفی ئەکەن و خۆیشیانی لێ بێ بەش ناکەن ﴿وکان بین ذلك قواما﴾ بەڵکو لەنێوان ئەو دووبارەدا مام ناوەندیین، وەك دەفەرموێ: (ولا تجعل یدك مغلولة إلى عنقك ولا تبسطها کل البسط) (٦٤/٥). (ئەبو دەرداء) لەپێغەمبەرەوە ﷺ ئەگێڕێتەوە: ((من فقه الرجل رفقه فی معیشته)) مسند أحمد (١٩٤/٥). واتە: لە تێگەیشتنی مرۆیە هەڵبژاردنی بارێکی مامناوەندیێ بۆ ژیانی خۆی. وە فەرموودەی: ((ما عال من اقتصد)) پێشەوا ئەحمەد. واتە: هەرکەسێ بارێکی مامناوەندیی بۆ خۆی هەڵبژێرێ لەژیاندا، هەژار نابێ. ﴿[٦٨] والذین لا یدعون مع الله إلها آخر﴾ شەشەم: ئەوانەن وێڕای خوا هیچ پەرستراوێکی تر ناپەرستن ﴿ولا یقتلون النفس التی حرم الله إلا بالحق﴾ کەسێکیش ناکوژن کە خوا کوشتنی یاساغ کردبێ، مەگەر بەهەق و ڕەوا، وەکو پاشگەز بوونەوە لەئیسلام، زینا کردن، کوشتنی خەڵکی بێ تاوان ﴿ولا یزنون﴾ زیناو شەرواڵ پیسیش ناکەن باسکردنی ئەم دوو سیفەتە پیاو نەکەوشتن و زینا نەکردن هەر بۆئەوەیە کە قورەیش هۆشیار بکاتەوە، چونکە ئەوان هەردوو سیفەتەکەیان تێدابوو ﴿ومن یفعل ذلك یلق أثاما﴾ وە هەرکەسێ ئەو کاروکردەوە ناپەسەندانە بکات، ئەوە لە دواڕۆژدا دەگات بەسزای تاوانەکەی خۆی ﴿[٦٩] یضاعف له العذاب یوم القیامة﴾ لەڕۆژی قیامەتیشدا دوو بەرامبەر ئازار دەدرێ، چونکە لەلایەکەوە هاوەڵی بۆ خوا بڕیار داوە، لەلایەکی تریشەوە ئەو گوناهە ناشیرینانەی کردووە ﴿ویخلد فیه مهانا﴾ و بەسووکی و زەلیلی و ڕیسواییەوە بەهەتا هەتایی‌هەر لەوێداً ئەمێنێتەوە. (عەبدوڵڵا) لە پێغەمبەری ﷺ پرسی: کام گوناح لەهەموان گەورەترە؟ فەرمووی: ((أن تدعو لله ندا وهو خلقك)) ئەوە کە تۆ هاوبەش و دژ بۆخوا دابنێیت، لەحاڵێکدا هەر ئەوتۆی دروستکردووە. دیسانەوە وتی: ئەی دوای ئەوە؟ فەرمووی:

((أن تقتل ولدك كراهية أن يطعم معك)) كوشتنی منالّی خۆت لەبەرئەوە خواردنت لەگەڵ بخوات لەپاشان پرسیاری لێکردەوە؟ ئەویش فەرمووی: ((أن تزانی حليلة جارك)) لەگەڵ ژنی دراوسێکەتدا زینا و ناپاکی بکەیت! پاشان ئایەتی (والذين لا يدعون مع الله...) تا کۆتاییەکەی خوێندەوە. تفسير الطبري ٤٢/١٩.

﴿[٧٠] إلا من تاب وآمن وعمل عملا صالحا﴾ مەگەر کەسێك پەشیمان دەبێتەوەو بڕوا بێنێ و کاری چاك ئەنجام بدا ﴿فأولئك يبدل الله سيئاتهم حسنات﴾ ئا ئەوکەسانە خوا گوناهو خراپەکانیان بۆ دەگۆڕێت بەچاکە. پێشەوا (موسلیم)یش لەم بارەیەوە ئەم فەرموودانەی هێناوە: ((إن الحسنات يذهبن السيئات)).. وە ((...أتبع السيئة الحسنة تمحها..)) بەردەوام لە جێگەی خراپەدا، چاکەبکە، تا خراپەکان بسرێتەوە. ئیمامی (تەبەریی) سەبارەت بەگۆڕینی تاوان و خراپە بەچاکە دەڵێ: ئەمە هەر لەدونیادا جێبەجێ ئەبێت. هەندێکی تریش ئەڵێن: نا، لەپاشەڕۆژدا تاوتوێ دەکرێت، (ئیبنی عەبباس و، حەسەن و، موجاهید)یش پشتگیری رای یەکەمن. وە (ئیبن کەسیر) دەڵێ: (ئیبن عەبباس وتوویەتی:(هم المؤمنون كانوا من قبل إيمانهم على السيئات فرغب الله بهم عن السيئات فحولهم إلى الحسنات، فأبدلهم مكان السيئات الحسنات). وقال سعيد بن جبير: (أبدلهم بعبادة الأوثان عبادة الرحمن، وأبدلهم بقتال المسلمين قتال المشركين...) وقال الحسن البصري: (أبدلهم الله بالعمل السيئ العمل الصالح، وأبدلهم بالشرك إخلاصا..) وقال بعض: (أن تلك السيئات الماضية تنقلب بنفس التوبة النصوح حسنات، كما ثبت بذلك السنة الصحيحة، وصحت به الآثار المروية عن السلف - رضي الله عنهم-). ﴿وكان الله غفورا رحيما﴾ وە هەمیشە خوا گوناه پۆش و میهرەبانە ﴿[٧١] ومن تاب وعمل صالحا﴾ وە ئەوەی لە گوناحەکانی تەوبەی کردو،کردەوەی چاکی کرد ﴿فإنه يتوب إلى الله متابا﴾ ئەوە بەڕاستیی زۆر بەمەزنی دەگەڕێتەوە بۆلای خوا.

الجزء التاسع عشر — سورة الفرقان

وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ
الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ
أَثَامًا (٦٨) يُضَاعَفْ لَهُ الْعَذَابُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِ
مُهَانًا (٦٩) إِلَّا مَن تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَالِحًا
فَأُولَٰئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ ۗ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا
رَّحِيمًا (٧٠) وَمَن تَابَ وَعَمِلَ صَالِحًا فَإِنَّهُ يَتُوبُ إِلَى اللَّهِ
مَتَابًا (٧١) وَالَّذِينَ لَا يَشْهَدُونَ الزُّورَ وَإِذَا مَرُّوا بِاللَّغْوِ
مَرُّوا كِرَامًا (٧٢) وَالَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ
لَمْ يَخِرُّوا عَلَيْهَا صُمًّا وَعُمْيَانًا (٧٣) وَالَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا
هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَاجْعَلْنَا
لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا (٧٤) أُولَٰئِكَ يُجْزَوْنَ الْغُرْفَةَ بِمَا
صَبَرُوا وَيُلَقَّوْنَ فِيهَا تَحِيَّةً وَسَلَامًا (٧٥) خَالِدِينَ
فِيهَا ۚ حَسُنَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا (٧٦) قُلْ مَا يَعْبَأُ بِكُمْ رَبِّي
لَوْلَا دُعَاؤُكُمْ ۖ فَقَدْ كَذَّبْتُمْ فَسَوْفَ يَكُونُ لِزَامًا (٧٧)

سورة الشعراء — مرتبها ٢٦ — آياتها ٢٢٧

٣٦٦

﴿[٧٢] والذين لا يشهدون الزور﴾ حەوتەم: ئەوانەن کە ئامادەی شایەتیدانیدرۆ نابن, شایەتییەك نادەن مافی خەڵکی تیا پێشێل بکرێ ﴿وإذا مروا باللغو مروا كراما﴾ وەکاتێك بەلای گوتارو کرداری نا پەسەندو پڕو پووچدا رادەبوورن، -وەك سینەماو قومارخانەو..هتد- بەڕێزەوە رادەبوورن. تێبینی: هەرکەس شایەدی درۆی دابا، پێشەوا (عومەر) چل شەلاقی لێئەداو رووی رەش ئەکردو، سەری ئەتاشی و، بەبازاڕدا ئەیگێڕا. ﴿[٧٣] والذين إذا ذكروا بآيات ربهم﴾ هەشتەم: ئەوانەن کاتی ئایەتەکانی پەروەردگاریان وە بیر هێنرایەوە، ئامۆژگاری وەردەگرن و ﴿لم يخروا عليها صما وعميانا﴾ ناڕۆن بەسەریاندا وەك کەڕو کوێر، بەڵکو گوێ هەڵدەخەن و چاو ئەکەنەوە. ﴿[٧٤] والذين يقولون ربنا هب لنا من أزواجنا وذرياتنا قرة أعين﴾ نۆیەم: ئەوانەن کە دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان! لەهاوسەرانمان و نەوەکانماندا مایەی رووناکی دیدە و، خۆشیمان پێ ببەخشە، تا هاوکاریمان بکەن لە خواپەرستیداو، گەل و

کۆمەڵێکی وامان ببێ، کەخواناس بێت ﴿واجعلنا للمتقين إماما﴾ وە خۆیشمان بگێڕە بە پێشەنگ بۆ لەخوا ترسان. هەربۆیە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ((إذا مات ابن آدم انقطع عمله إلا من ثلاث: ولد صالح يدعو له، أو علم ينتفع به من بعده، أو صدقة جارية)) مسلم، كتاب الوصية/ ٢٥٥، کاتێ ئادەمزاد دەمرێت ئیتر هەموو کاروکردەوەکانیشی کۆتاییان دێ، مەگەر لەڕێگەی سێ شتەوە: منداڵێکی صاڵح و چاکی ببێ دوعای خێری بۆ بکا، زانستێکی بەجێ هێشتبێ "پاش خۆی" کەڵکی لێ وەر بگیردرێ، سێیەم: خێرو صەدەقەیەکی بەردەوامیی بەجێ هێشتبێ. ﴿[٧٥] أولئك يجزون الغرفة بما صبروا﴾ دەیەم: ئا ئەو بەندە بەڕێزانە، کە ئەوهەموو سیفەتە قەشەنگانەیان هەیە لەپاداشی خۆڕاگرتنیان ژووره رازاوەکانی بەهەشتیان پێدەدرێ، هەر لەوێش پایەوپلەی بەرزوبڵندیان دەدرێتێ لەسەر خواپەرستیی ﴿ويلقون فيها تحية وسلاما﴾ وە لە لایەن فریشتەکانیشەوە بەسڵاوو درورد پێشوازییان لێدەکرێ ﴿[٧٦] خالدين فيها حسنت مستقرا ومقاما﴾ بەهەتا هەتاییش هەر لەوێ ئەمێننەوە، وە بەڕاستیی بەهەشت بنکە و جێگایەکی خۆشە. ﴿[٧٧] قل ما يعبأ بكم ربى لولا دعاؤكم﴾ یازدەهەم: ئەی موحەممەد ﷺ پێیان بڵێ: (خەڵکینە) پەروەردگارم هیچ بایەخێکتان پێنادات، ئەگەر لەبەری نەپاڕێنەوەو نەیپەرستن، واتە: ئەو ڕێز لێنانەتان بەهۆی چاکی و راساڵی و ملدانتانە بەفەرمانەکانی ئەو ﴿فقد كذبتم فسوف يكون لزاما﴾ بەراستی ئێوەش (ئەی بێباوەڕان) ئەو پەیامبەرو قورئانەتان بەدرۆ خستەوە و بڕواتان پێ نەهێنان، ئەگەر هەر وابن ئەوە لەدواڕۆژدا سزایەکی خوایی یەخەتان پێدەگرێ و هەرگیز لەکۆڵتان نابێتەوە.

زۆرو فراوان شوکرانەی خوای کار جوان دەکەم کە شەرەفی تەواوکردنی نووسینی سوورەتی (فورقان)ی پێدام لە مزگەوتی (فورقان)ی هەولێری خواناس.

*** *** ***

## ٢٦- سوورەتی ( شوعەرا ) یە

## مەککەییەو ( ٢٢٧ )ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتە بۆچەسپاندنی بناغە سەرەکییەکانی ئایین هاتووە: یەکتاپەرستیی، پەیامەکەی پەیامبەر ﷺ، زیندووبوونەوە. جا لەسەرەتاوە باسێکی کورتی قورئان ئەکات، کە چۆن بەوشێوە قەشەنگە خوا ناردوویەتی بۆهیدایەت و ڕێنمونی خەڵك و دەرمانکردنی نەخۆشیەکانی مرۆڤ، هاوکات لەگەڵ هەڵوێستی چەوتی هاوبەش پەیداکەراندا بەرامبەری، لەگەڵ هێنانی ئەوهەمووبەڵگەو نیشانە ئاشکراو روونانەدا تێیدایە!! باسی دەستەیەك لە پەیامبەرانیش دەکات کە خوا ناردوونی بۆ ڕێ نیشاندانی گەلان، ئەمەیش لە موساوە عليه السلام دەست پێدەکات کەچۆن بەوشێوە ناوازەیە لەگەڵ ئەو سەر سەخت و، کەللە رەقەدا -فیرعەون- رووبە رووبوویەوە، بەڵام ئەم هەر کۆڵینەداو, کۆڵینەدا تابەفەرمانی خوا ئەم سەرکەوت وپیرۆز بوو، ئەویش لەناوچوو، ئینجا دێتە سەرداستانەکەی ئیبراهم و هەڵوێستی لەگەڵ هۆزونەتەوەکەیی و باوکیدا, بەرامبەر بەبتپەرستنیان، ئەوە بووبەڵگەی زۆربەهێزو، بە ئەقڵ و ژیریی کەم وێنەی خۆی توانی پرو‌پووچیی خواکانیان روون بکاتەوە بۆیان، هاوڕێ لەگەڵ دیاریی کردنی چارەنووسی هەردوولایان (خۆیی وقەومەکەی) وە داستانیپەیامبەران: (نوح، هود، صالح، لووط، شوعەیب/ علیهم الصلاة والسلام) باسدەکات ,وە بەرنامەو سوننەتیخوایی لەبەرامبەر ئەوانەی بە درۆیان خستنەوە، بەدیار دەخات ﴿وإنه لتنزيل رب العالمين * نزل به الروح الأمين على قلبك لتكون من المنذرين بلسان عربى مبين﴾ ٢٦/١٩٢-١٩٥.

کۆتاییشی دێت بە ڕەواندنەوەی بەد گومانی ئەوانەی کە دەیانوت قورئان جنیەکان دەیهێنن بۆی!! وە لە گەورەیی ومەزنی سوورەتەکانی (طسم)دا پێغەمبەر ئەفەرموێ: ((إن الله أعطاني السبع الطوال مكان الإنجيل، وأعطاني الطواسين مكان الزبور، فضلني بالحواميم و المفصل، ما قرأهن نبی قبلی)). السیوطی فی جمع الجوامع (٤٧٠٠)و الهندی فی كنز العمال (٢٥٨١).

﴿بسم الله الرحمن الرحيم * [١] طسم﴾ ئەم پیتانە هەرچەند لەگەڵ شوێندا لێیان دواوین، بەڵام کورتەی هەرهەموویان ئەوەیە کە: ئەو قورئانە وائەوان دانی پیانانێن، هەر لەوجۆرە پیتانە پێکهاتووە، جا ئەگەر بێزاری و، نکوڵی لێ دەرئەبڕن، دەفەرموون وێنەی بێنن! ﴿[٢] تلك آيات الكتاب المبين﴾ ئەم ئایەتانە -کەلەم سورەتەدا هەن- ئایەتی کتێبێکی زۆر ڕوون وئاشکراکارە بەجۆرێ کە ئەگەرکەسێك کەمێك تیفکرێ لێیان، چاك ئەزانێ لەخواوە هاتوون ﴿[٣] لعلك باخع نفسك الايكونوا مؤمنين﴾ لەوانەیە لەداخ وخەفەتدا خۆت لەناو ببەیت، لەبەر ئەوە کەئەوانە باوەڕ ناهێنن، واتە: تۆئاوا مەبە، چونکە تۆتەنها ئاگاداریان بکەو بیانترسێنە، ئیتر باوەڕ بهێنن، یان نا، تۆبەرپرس نابیت لێیان. دیارە ئەمە بۆدڵدانەوەی پەیامبەرە ﷺ، هەمان مەبەستیش لە سوورەتی (٦/١٨):(فلعلك باخع نفسك...) وە لە ئایەتی (٨٨-١٥/٩٠)یشدا ڕوون کراوەتەوە.

الجزء التاسع عشر — سورة الشعراء

بسم الله الرحمن الرحيم

طسٓمٓ ﴿١﴾ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ ﴿٢﴾ لَعَلَّكَ بَٰخِعٞ نَّفۡسَكَ أَلَّا يَكُونُواْ مُؤۡمِنِينَ ﴿٣﴾ إِن نَّشَأۡ نُنَزِّلۡ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ءَايَةٗ فَظَلَّتۡ أَعۡنَٰقُهُمۡ لَهَا خَٰضِعِينَ ﴿٤﴾ وَمَا يَأۡتِيهِم مِّن ذِكۡرٖ مِّنَ ٱلرَّحۡمَٰنِ مُحۡدَثٍ إِلَّا كَانُواْ عَنۡهُ مُعۡرِضِينَ ﴿٥﴾ فَقَدۡ كَذَّبُواْ فَسَيَأۡتِيهِمۡ أَنۢبَٰٓؤُاْ مَا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴿٦﴾ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ إِلَى ٱلۡأَرۡضِ كَمۡ أَنۢبَتۡنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوۡجٖ كَرِيمٍ ﴿٧﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗۖ وَمَا كَانَ أَكۡثَرُهُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿٨﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٩﴾ وَإِذۡ نَادَىٰ رَبُّكَ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱئۡتِ ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠﴾ قَوۡمَ فِرۡعَوۡنَۚ أَلَا يَتَّقُونَ ﴿١١﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ ﴿١٢﴾ وَيَضِيقُ صَدۡرِي وَلَا يَنطَلِقُ لِسَانِي فَأَرۡسِلۡ إِلَىٰ هَٰرُونَ ﴿١٣﴾ وَلَهُمۡ عَلَيَّ ذَنۢبٞ فَأَخَافُ أَن يَقۡتُلُونِ ﴿١٤﴾ قَالَ كَلَّاۖ فَٱذۡهَبَا بِـَٔايَٰتِنَآۖ إِنَّا مَعَكُم مُّسۡتَمِعُونَ ﴿١٥﴾ فَأۡتِيَا فِرۡعَوۡنَ فَقُولَآ إِنَّا رَسُولُ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٦﴾ أَنۡ أَرۡسِلۡ مَعَنَا بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ﴿١٧﴾ قَالَ أَلَمۡ نُرَبِّكَ فِينَا وَلِيدٗا وَلَبِثۡتَ فِينَا مِنۡ عُمُرِكَ سِنِينَ ﴿١٨﴾ وَفَعَلۡتَ فَعۡلَتَكَ ٱلَّتِي فَعَلۡتَ وَأَنتَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿١٩﴾

٣٦٧

**ئامانەوێ بەزۆر ئیمان بەسەریاندا بسەپێنین:**

﴿[٤] إن نشأ ننزل عليهم من السماء آية﴾ ئەگەر بمانەوێ ئەوانە ناچار بکەین بڕوابهێنن، ئەوا لە ئاسمانەوە موعجیزەو نیشانەیەکیان بۆدادەبەزێنین ﴿فظلت اعناقهم لها خاضعين﴾ ئەوسا لەبەرامبەریەوە بەردەوام گەردنیان کەچ دەبێ بۆی‌و، بەناچاریش بڕوا دێنن، بەڵام سوننەتمان وانیە. ﴿[٥] وما يأتيهم من ذكر من الرحمن محدث﴾ ئەوانە هەربەشێکی نوێ‌وتازەی قورئانیان لە لایەن خوای بەخشندەوە بۆبێت ﴿إلا كانوا عنها معرضين﴾ لەبەرامبەریەوە ڕوو وەرئەگێڕن وپشتی‌لێ‌دەکەن، واتە: پیشەیان هەمیشە هەرئینکاری کردنی قورئان بووە ﴿[٦] فقد كذبوا فسيأتيهم انباء ما كانوا به يستهزئون﴾ ئەوانەبەو وەحیە تازەیەی ئێمە بڕوایان نەهێناوبەدرۆیان زانی! جالە ئاییندەیەکی نزیکدا هەواڵەکانی ئەوسزایەیان پێدەگا کە ئەوان گاڵتەیان پێ‌ئەکرد ﴿[٧] أولم يروا إلى الأرض كم انبتنا فيها من كل زوج كريم﴾ ئایا ئەو هاوبەشدانەرانە سەیری زەوییان نەکردووەو ورد نەبوونەتەوە کە چ گژو گیایەکی زۆر و، جۆراو جۆری جووت و بەبایەخ و جوانمان تیا ڕواندووە؟ ﴿[٨] إن فی ذلك لآية﴾ بەڕاستیی ئا لەو گیاو گوڵ و سەوزەڵانیەدا بەڵگە هەیە بۆ زیندووبوونەوە ﴿وماكان اكثرهم مؤمنين﴾ کەچی لەگەڵ ئەوەیشداهەرە زۆریان بڕوا ناهێنن، واتە:هێمان ئەو هەموونیشانە سەرسوڕهێنەرانە تینیان تێ ناکات! ﴿[٩]

﴿وإن ربك لهوالعزيز الرحيم﴾ جائەوانە با هەر وابن،و هەرگیزیش لەدەست دەرناچن, چونکە بەڕاستیی پەروەردگاری تۆ دەسەڵاتدارو زاڵە بەسەر هەمووشتێکدا, دلۆڤان ومیهرەبانیشە ,ئەگەر پەشیمان ببنەوە لێیان خۆش ئەبێ.

**لەنێوان مووساو فیرعەوندا :**

خوا دڵخۆشی پەیامبەر ﷺ ئەداتەوەکە:تەنها ئەو عەزیەت و ئازار نەدراوەو، بەتەنها هەر گەلەکەی ئەویش نیە سەرپێچی کردبێت , بۆیە دەفەرموێ: ﴿[١٠] وإذ نادى ربك موسى﴾ ئەوکاتە وەبیربێنە کە پەروەردگارت لە لای کێوی طوردا موسای بانگکرد: ﴿أن ائت القوم الظالمين﴾ کە بچۆ بۆلای ئەو گەلە ستەمکارە, ئەوانەی ستەمیان هەم لە خۆیان و،هەم لە گەلی بەنی ئیسرائیل کردووەو، کردوویانن بە کۆیلە ﴿[١١] قوم فرعون﴾ هۆزوگەلی فیرعەون ﴿ألا يتقون﴾ پێیان بڵێ: ئایا لە سەرەنجامی نافەرمانی خوا ناترسن و پارێز ناکەن؟﴿[١٢] قال رب إني أخاف أن يكذبون﴾ موسا وتی: ئەی پەروەردگارم! من ئەترسم بەدرۆم بخەنەوەو بڕوام پێ نەکەن پەیامبەریتۆبم ﴿[١٣] ويضيق صدري﴾ سینەتەنگ بم ﴿ولا ينطلق لساني﴾ و زمانم باش هەڵنەسوڕێ بۆ ڕاگەیاندنی پەیامەکەم ﴿فأرسل إلى هارون﴾ جاپەیام بۆ - براکەشم- هاروون بنێرە، تایارمەتیم بدات، چونکە زمانی ڕەوانترە,جاجگە لەوە دیسان هۆیەکی تریاس ئەکات: ﴿[١٤] ولهم علي ذنب﴾ بێگومان ئەوان تۆڵەی گوناهێکیان بەسەرمەوە هەیە,واتە: یەکێکیانم لێکوشتوون ﴿فأخاف أن يقتلون﴾ ئەترسم بەو بۆنەوە بمکوژنەوەو پەیامەکەم بۆ نەگات.لە سوورەتی (٣٣/٢٨):دا ئەفەرموێ: (قال رب إني قتلت منهم نفسا فأخاف أن يقتلون) دەرئەکەوێ کە گوناهەکەی بەلای ئەوانەوە کوشتنی (قبطي)یەکەیە، هەروەك شێوەی کوشتنەکەش لەسوورەتی (١٥/٢٨) ئاشکراکردووە ﴿[١٥] قال كلا﴾ خوا فەرمووی: نەخێر، گومانت وانەبێودڵنیابە هەرگیزئەوانە ناتوانن کاری وابکەن ﴿فاذهبا بآياتنا﴾ جاخۆ تۆو هارون, هاوڕێ بەئایەت وبەڵگەکانی ئێمەوە بڕۆن بۆ لای فیرعەون وگەلەکەی ﴿إنا معكم مستمعون﴾ بەڕاستی خۆمان لە گەڵتانین بەپارێزگاریی‌و، گوێ بیستی قسەکانتانین, واتە:لەگوفتارو وتەکانی ئێوەو، لە وەڵامی ئەوان بەئاگاین. لە سوورەتی: (٤٦/٢٠) وە (٣٥/٢٨) خوا ئەو(لەگەڵ بوونە) یان بۆدوویات ئەکاتەوە ﴿[١٦] فأتيا فرعون﴾ بچن بۆ لای فیرعەون ﴿فقولا إنا رسول رب العالمين﴾ و بڵێن: بێگومان ئێمە هەردوکمان پێغەمبەرو نێرراوی پەروەردگاری جیهانەکانین. لە سورەتی(٤٧/٢٠)دا: (فقولا إنا رسولا ربك) هاتووە.﴿[١٧] أن أرسل معنا بني إسرائيل﴾ داوات لێ ئەکەین کە بەنی ئیسرائیلمان لە گەڵ بنێرەو ڕێیان لێ مەگرە، بچن بۆ شام جا فیرعەون - وەك منەتنان بەسەر بەمووسادا. بەڵێ هەردووکیان ڕۆیشتنە لای فیرعەون و پەیامەکەیان پێگەیاند ﴿[١٨] قال ألم نربك فينا وليدا﴾ فیرعەون بە موسای گوت: ئەرێ ئەمەیە پاداشتی پیاوەتیت؟! ئەی تۆمنداڵێکی بچووك نەبوویت، لەناو خۆماندا پەروەردەمان کردیت؟ ئیتر ئێستا ئەم داوایەت لەچیە؟!. لەسوورەتی (٩/٢٨ و ٣٩/٢٠) ئەوشێوەی بەخێوکردن وپەروەردەیە روون دەکاتەوە ﴿ولبثت فينا من عمرك سنين﴾ وە سەرەرای ئەوەیش ئایا تۆ چەند ساڵێکی زۆر تەمەنت لەناوماندا نەبردە سەر؟ خۆتۆ ئەوماوەیە ئەوقسەوباسەت هەر نەدەکرد، کەچی وا ئێستا لە باتی ئەوەکە مەمنوونمان بیت داوای کوێخاییمان لێئەکەیت؟! ﴿[١٩] وفعلت فعلتك التي فعلت﴾ وە تۆئەوکارە گەورەیەشت کرد کەکردت، قیبتیە خزمە نزیکەکەی منت کوشت. لەسوورەتی (١٥/٢٨ و ١٩/٢٨) دا ئەو کارەی کە مووسا کردوویەتی باسیدەکات ﴿وأنت من الكافرين﴾ کەچی تۆ لە پاداشی پیاوەتیماندا لە ڕیزی ناسوپاسانیت ﴿[٢٠] قال فعلتها إذا وأنا من الضالين﴾ موسا وتی: بەلێڕاستە، ئەوەم لەدەس قەوما, بەلام من کاتێ ئەوکارەمکرد، لە هەڵەکاران و بێخەبەران بووم، وە پێش پەیامبەرایەتیم بوو، وە من بەنیازی سەرزەنش کردنیشەوە مشتەکۆڵەیەکم لێدا، نەك

بەنیازی کوشتنەوە ﴿[٢١] ففررت منكم لما خفتكم﴾ ئینجا چوون لە ئێوە دە ترسام ,بمکوژنەوەهەڵهاتم بۆ وڵاتی مەدیەن. لە سوورەتی (٢٨/٢٠-٢١) وە (١٨/٢٨) دا ئەندازەو جۆری ترسەکە باسکراوە. ﴿فوهب لى ربى حكما﴾ جا ئیتر پەروەردگارم –جل جلاله– دانایی وکارزانی و، زانیاریی پێ بەخشیم ﴿وجعلنى من المرسلين﴾ و کردیشمی بە یەکێ لە پەیامبەران" و ناردمی بۆ لای ئێوە ﴿[٢٢] وتلك نعمة تمنها على﴾ موسا ئەیەوێ کارەکەی فیرعەون کەم نرخ وبێ منەت بکات، بۆیە ئەڵێت: تۆمنەتیئەو بەخێو کردنەیشم دەخەیتە سەر، بێگومان من ئەوە بە نیعمەت و پیاوەتی دانانێم ﴿أن عبدت بنى إسرائيل﴾ چونکە تۆ نەوەکانی یەعقوبت هەموو کردۆتە کۆیلەو خزمەتکاری خۆت؟! ﴿[٢٣] قال فرعون وما رب العالمين﴾ ئینجا فیرعەون بە موسای وت: کە تۆپێت وایە پەیامبەری پەروەردگاری جیهانەکانی؟! باشە ئەو پەروەردگاری جیهانیانە کێیە؟! ئایەتەکانی سوورەتی (٤٩/٢٠) و (/٢٩/٢٦) و (١٠٢/١٧) و (١٤/٢٧) بۆ ڕۆشن کرنەوەی ئەم مەبەستەیەن. ﴿[٢٤] قال رب السموات والأرض وما بينهما﴾ موسا وتی: هەرگیز تۆخوانیت، خوای جیهانەکان, پەروەردگارو بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەویی و ئەوەی لە نێوانیاندایە, ئەی تۆ چیت بە دەستە؟ ﴿إن كنتم موقنين﴾ ئەگەر دڵێکی وریاو چاویکی کراوەتان هەبێت و لە یەقین داران بن بەو وەڵامە. جا فیرعەون لە قسەکەی موسا زۆر سەری سوڕما، بۆیە بەفیزێکەوە بەوانەی لە دەوروبەرییدا بوون گوتی: ﴿[٢٥] قال لمن حوله الا تستمعون﴾ ئایا نابیسن ئەم پیاوە چی ئەڵێ؟ سەیرە! ئەو پێی وایە کە بیجگە لە من خوایەکی تر هەیە! ﴿[٢٦] قال ربكم ورب آبائكم الأولين﴾ مووسا ئەیەوێ پتر سیفەتی خوایان بۆ ڕۆشن بکاتەوە، بۆیە وتی: خەڵکینە! هەر ئەو خوایە، پەروەردگاری ئێوەش و پەروەردگاری باووباپیرانە پێشینەکانیشتانە , لەنەبوون ئێوەی دروست کردووە، ئیترفیرعەون کەی خوایە؟! فیرعەون کە پەکی ئەکەوێ لە ڕەتدانەوەی مووسادا،ئیتر ئەیەوێ سووکایەتی بە کەسایەتی ئەو بکاو لەپێش چاوی خەڵکەکەدا بیشکێنێ بۆیە بەگاڵتەوە ﴿[٢٧] قال إن رسولكم الذى أرسل إليكم لمجنون﴾ وتی: خەڵکینە! وا دیارە ئەو پێغەمبەرەی کە بۆئێوە نێردراوە دیوانەو شێتە!! ئەگینا چۆن قسەی وائەکات؟ ﴿[٢٨] قال رب المشرق و المغرب و مابينهما إن كنتم تعقلون﴾ موسا زیاترو زیاتر وەسفی خوایان بۆ ئەکات، بۆیە وتی: ئەو خوایە،ڕاهێنەروپەروەردگاری خۆرهەڵات و خۆرئاواوگشت ئەوشتانەشە لە نێوانیاندایە، ئەگەرئارەزووفامتان هەبێ و، بیروئەقڵتان بخەنە کار، خوائەوەیە کە دەتوانێ ئەستێرەکان لە خۆرهەڵات هەڵبێنێ‌و,لەخۆرئاواوە, ئاوایان بکا ﴿[٢٩] قال لئن إتخذت إلها غيرى﴾ کاتێ فیرعەون پەکی کەوت وهیچی بۆنەمایەوە پەنایبردە بەرهەڕەشەکردن و وتی: بێگومان ئەگەرچگە لە من کەسێکیتربپەرستیی‌و بیکەیتە خوای خۆت ﴿لاجعلنك من المسجونين﴾ دڵنیابە ئەتخەمە ڕیزی زیندانکراوەکانەوە,

سُورَةُ الشُّعَرَاءِ — الجُزْءُ التَّاسِعَ عَشَرَ

قَالَ فَعَلْتُهَآ إِذًا وَأَنَا۠ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٢٠﴾ فَفَرَرْتُ مِنكُمْ لَمَّا خِفْتُكُمْ
فَوَهَبَ لِى رَبِّى حُكْمًا وَجَعَلَنِى مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٢١﴾ وَتِلْكَ نِعْمَةٌ تَمُنُّهَا
عَلَىَّ أَنْ عَبَّدتَّ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٢٢﴾ قَالَ فِرْعَوْنُ وَمَا رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ
﴿٢٣﴾ قَالَ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ
﴿٢٤﴾ قَالَ لِمَنْ حَوْلَهُۥٓ أَلَا تَسْتَمِعُونَ ﴿٢٥﴾ قَالَ رَبُّكُمْ وَرَبُّ ءَابَآئِكُمُ
ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٢٦﴾ قَالَ إِنَّ رَسُولَكُمُ ٱلَّذِىٓ أُرْسِلَ إِلَيْكُمْ لَمَجْنُونٌ ﴿٢٧﴾
قَالَ رَبُّ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِن كُنتُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٢٨﴾ قَالَ
لَئِنِ ٱتَّخَذْتَ إِلَٰهًا غَيْرِى لَأَجْعَلَنَّكَ مِنَ ٱلْمَسْجُونِينَ ﴿٢٩﴾ قَالَ
أَوَلَوْ جِئْتُكَ بِشَىْءٍ مُّبِينٍ ﴿٣٠﴾ قَالَ فَأْتِ بِهِۦٓ إِن كُنتَ مِنَ
ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٣١﴾ فَأَلْقَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِىَ ثُعْبَانٌ مُّبِينٌ ﴿٣٢﴾ وَنَزَعَ يَدَهُۥ
فَإِذَا هِىَ بَيْضَآءُ لِلنَّٰظِرِينَ ﴿٣٣﴾ قَالَ لِلْمَلَإِ حَوْلَهُۥٓ إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٌ
عَلِيمٌ ﴿٣٤﴾ يُرِيدُ أَن يُخْرِجَكُم مِّنْ أَرْضِكُم بِسِحْرِهِۦ فَمَاذَا
تَأْمُرُونَ ﴿٣٥﴾ قَالُوٓا۟ أَرْجِهْ وَأَخَاهُ وَٱبْعَثْ فِى ٱلْمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ
﴿٣٦﴾ يَأْتُوكَ بِكُلِّ سَحَّارٍ عَلِيمٍ ﴿٣٧﴾ فَجُمِعَ ٱلسَّحَرَةُ
لِمِيقَٰتِ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴿٣٨﴾ وَقِيلَ لِلنَّاسِ هَلْ أَنتُم مُّجْتَمِعُونَ ﴿٣٩﴾

لَعَلَّنَا نَتَّبِعُ ٣٦٨

خۆیشت چاك ئەزانی هەر کەسێ من زیندانی بکەم هەرگیز رزگاری نابێ ﴿[30] قال اولو جئتك بشئ مبين﴾ موسا زۆر لەسەر خۆ وتی: باشە ئەگەر بەڵگەیەکیزۆر روون و ئاشکرایشم بۆهێنای لەسەر راستیی خۆم؟ تۆ هەر زیندانیم ئەکەیت و باوەڕ ناهێنی؟ ﴿[31] قال فائت به إن كنت من الصادقين﴾ فیرعەون وتی: ئادەی ئەگەر لە راستگۆیانیت فەرموو بەڵگەکانت بێنە"فیرعەون وای ئەزانی ئەگەر بیهێنێت ئەو ئەتوانێ بەرهەڵستی بوەستێ!! ﴿[32] فألقى عصاه فإذا هى ثعبان مبين﴾ مووساش دەست بە جێ دارەدەستەکەی خۆی فرێدا و بوو بە ئەژدیهایەکی گەورە ﴿[33] ونزع يده فإذا هى بيضاء للناظرين﴾ لەوە ئەچێ فیرعەون داوای نیشانەیەکی تری کردبێت، بۆیە موساش "دەستی خستە بن هەنگڵی خۆی و هێنایە دەرەوە، کتوپڕ لە پێش چاوی بینەراندا سپی و رووناك دەرچوو، ئەو دەوروبەرەی رووناککردەوە، هەر وەك مانگ هەڵبێت ﴿[34] قال للملإ حوله إن هذا لساحر عليم﴾ فیرعەون کە ئەمەی بینی بەگەورەگەورەکانیدەورو بەری خۆی گوت: بێگومان ئەمە جادوو بازێکی زۆر زاناو بەتوانایە, مەبەستی ئەوەیە بڵێ: بەمە فریومەخۆن، چونکە ئەوەی بینیتان لە کاری جادووبازانە. ﴿[35] يريدان يخرجكم من ارضكم بسحره﴾ ئەیەوێ بەجادوویخۆی لەجێ وزێدو وڵاتی خۆتان دەرتان بکات. ﴿فماذا تأمرون﴾ جا ئێوەلەوبارەوە فەرمانتان بەچییە؟ چی بکەین باشە بۆ بەرهەڵستی ئەم بەڵایە ﴿[36] قالوا ارجه واخاه﴾ ئەوانیش وتیان: خۆی وبراکەی مۆڵەت بدە, واتە:پەلە مەکە ﴿وابعث فى المدائن حاشرين﴾ وە سەربازان بنێرەبۆ تەواوی شارەکانی ژێر دەسەڵاتت , جادوو بازانت بۆ کۆ بکەنەوە ﴿[37] يأتوك بكل سحار عليم﴾ ئەوساهەرچی جادوبازێکی کارامەوزۆر زانە بۆت دێنن.



لَعَلَّنَا نَتَّبِعُ ٱلسَّحَرَةَ إِن كَانُواْ هُمُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴿٤٠﴾ فَلَمَّا جَآءَ ٱلسَّحَرَةُ
قَالُواْ لِفِرْعَوْنَ أَئِنَّ لَنَا لَأَجْرًا إِن كُنَّا نَحْنُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴿٤١﴾ قَالَ نَعَمْ
وَإِنَّكُمْ إِذًا لَّمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٤٢﴾ قَالَ لَهُم مُّوسَىٰٓ أَلْقُواْ مَآ أَنتُم مُّلْقُونَ
﴿٤٣﴾ فَأَلْقَوْاْ حِبَالَهُمْ وَعِصِيَّهُمْ وَقَالُواْ بِعِزَّةِ فِرْعَوْنَ إِنَّا لَنَحْنُ
ٱلْغَٰلِبُونَ ﴿٤٤﴾ فَأَلْقَىٰ مُوسَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِىَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ
﴿٤٥﴾ فَأُلْقِىَ ٱلسَّحَرَةُ سَٰجِدِينَ ﴿٤٦﴾ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٧﴾
رَبِّ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴿٤٨﴾ قَالَ ءَامَنتُمْ لَهُۥ قَبْلَ أَنْ ءَاذَنَ لَكُمْ إِنَّهُۥ
لَكَبِيرُكُمُ ٱلَّذِى عَلَّمَكُمُ ٱلسِّحْرَ فَلَسَوْفَ تَعْلَمُونَ لَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ
وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَٰفٍ وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٤٩﴾ قَالُواْ لَا ضَيْرَ إِنَّآ
إِلَىٰ رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ ﴿٥٠﴾ إِنَّا نَطْمَعُ أَن يَغْفِرَ لَنَا رَبُّنَا خَطَٰيَٰنَآ أَن كُنَّآ
أَوَّلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٥١﴾ ۞ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِىٓ إِنَّكُم
مُّتَّبَعُونَ ﴿٥٢﴾ فَأَرْسَلَ فِرْعَوْنُ فِى ٱلْمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ﴿٥٣﴾ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ
لَشِرْذِمَةٌ قَلِيلُونَ ﴿٥٤﴾ وَإِنَّهُمْ لَنَا لَغَآئِظُونَ ﴿٥٥﴾ وَإِنَّا لَجَمِيعٌ حَٰذِرُونَ
﴿٥٦﴾ فَأَخْرَجْنَٰهُم مِّن جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿٥٧﴾ وَكُنُوزٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ ﴿٥٨﴾
كَذَٰلِكَ وَأَوْرَثْنَٰهَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٥٩﴾ فَأَتْبَعُوهُم مُّشْرِقِينَ ﴿٦٠﴾

الحزب ٣٧



### لەنێوان مووساو جادووبازەکاندا:

﴿[38] فجمع السحرة لميقات يوم معلوم﴾ ئینجا جادوو بازەکان لەسەرفرمانەکەی ئەو لەرۆژێکی دیاریی کراودا کۆکرانەوە" دیارە فیرعەون ئەیەوێ خەڵکێکی زۆر کۆببێتەوەو لە پێش چاوی هەموانەوە ئابڕووی مووسا بەرێ!! ﴿[39] وقيل للناس هل انتم مجتمعون﴾ بەخەڵکەکەش وترا: ئاخۆئێوە کۆدەبنەوە؟ "لەوە دەچێ فیرعەون زۆردڵنیابێ لەسەرکەوتندا، بۆیە ئاواپەلەدەکات ﴿[40] لعلنا نتبع السحرة إن كانوا هم الغالبين﴾ ئەگەرئەم جادووبازانە سەرکەوتووپیرۆز بوون وبردیانەوە, لەوانەیە ئێمەش پشتگیری وپەیڕەویان لێبکەین ﴿[41] فلما جاء السحرة قالوا لفرعون﴾ ئینجا جادووبازەکان کەهاتنە بەرەوە بەفیرعەونیان وت: ﴿إن لنا لأجرا إن كنا نحن الغالبين﴾ ئایا ئەگەر ئێمە پیرۆزوسەرکەوتووبووین و بردمانەوە هیچ کرێ وپاداشێکمان بۆدەبێت؟ ﴿[42] قال نعم وإنكم إذا لمن المقربين﴾ فیرعەون وتی: بەڵێ، بێگومان ئەوسا ئێوە لەریزی پیاوە نزیکە تایبەتمەندە کانی خۆم دەبن ﴿[43] قال لهم موسى القوا ماانتم ملقون﴾ جارۆژی دیاریکراو هاتوو, مووسا بەجادووگەرانی گوت: ئێوە دەست پێبکەن وچیتان پێیە

بۆهاویشتن بیهاوێژن, من هیچ ترسێکم نیه، چونکه خوام له گەڵه ﴿٤٤ فألقوا حبالهم و عصيهم﴾ جا ئەوانیش هەرچی پەت وداردەستەکانیان بوو, توورپیان هەڵداوهاویشتیان ﴿وقالوا بعزة فرعون إنا لنحن الغالبون﴾ وتیان: بەیارمەتیی ودەسەڵات وتوانایی فیرعەون: ئێمە بەسەر مووسادا زاڵ ئەبین ودەیبەینەوه، دیاره – وەك (شێخی ئالووسی) دەڵێ– سوێند خواردن بە نیعمەت و، گەورەیی و دەسەڵاتی (پاشا) کان و دەسەڵاتدارانی ڕۆژگار، وەهەروا بەسەرووریش و، گۆڕوگڵی سەرگۆڕی پیاوچاکان، داب ونەریتی سەردەمی جاهیلیەت ونەفامییه. زاناکان دەڵێن: گوناحی سوێند بە درۆ خواردن بە زاتی خوا بچووکتره، لە گوناحیسوێند خواردن بەراستیی بەوجۆره شتانه. ﴿٤٥ فألقى موسى عصاه فإذا هي تلقف ما يأفكون﴾ ئەوسا مووسایش داردەستەکەی خۆی توورهەڵداو، کتوپر بووبە مارێکی گەوره وهەمووداروگوریسی ئەوانی چنییەوەو هەڵی لووشیین ﴿٤٦ فألقى السحرة ساجدين﴾ ئیتر جادووبازەکان هەر هەموویان ,کاتێ ئەوەیان بینی خۆیان بۆنەگیراو سوژدەو کرنووشیان برد بۆخوا, چونکه بۆیان دەرکەوت کە ئەو کارەی مووسا ﷺ مۆجیزەیه، نەك جادوو" ﴿٤٧ قالوا آمنا برب العالمين﴾ بە راشکاوی وتیان: ئێمە باوەڕمان بە پەروەردگاری جیهانەکان هێنا ﴿٤٨ رب موسى وهارون﴾ پەروەردگاری مووساوهاروون.

**لەنێوان فیرعەون و جادووبازەکاندا:**

﴿٤٩ قال آمنتم له قبل ان آذن لکم﴾ فیرعەون وتی: هەرئاوا باوەڕتان پێهێنا, بەرلەوەی من مۆڵەتتان بدەم؟! دەبوو داوای مۆڵەتم لێبکەن ﴿إنه لكبيركم الذي علمكم السحر﴾ ئەوا دەرکەوت کەهەر مووساگەورەتانه، ئەوئێوەی فێری جادوو کردووه، فیرعەون ئەیەوێ بە خەڵکەکە بڵێت: فریو نەخۆن بەو بڕوا هێنانەیان، چونکه بە نهێنی دەستیان لەگەڵ موسادا تێکەڵ کردووه بۆ ڕووخاندنی حکومەتەکەتان ﴿فلسوف تعلمون﴾ لە ئاییندەیەکی نزیکدا ئەزانن چیتان پێ ئەکەم ﴿لأقطعن أيديكم وأرجلكم من خلاف﴾ ئەمە سوێندی بێت، دەبێدەست وپێتان –ڕاست وچەپ– بقرتێنم, دەستی ڕاست وقاچیچەپ، یان بەپێچەوانەوه:دەستیچەپ، قاچی ڕاست ﴿ولأصلبنكم اجمعين﴾ و هەمووشتان لەداردەدەم ﴿٥٠ قالوا لا ضير﴾ وتیان: کەیفی خۆته، چی ئەکەی بیکه، دڵنیاشبه کەهیچ زیانێك نابێت، تازه ئێمە بڕوامان هێناوه. (قال الجوهري: ضاره يضره و يضيره ضيرا وضوارا أي: ضره. قال الكسائي: التضور: الصياح و التلوى عند الضرب أو الجوع. ﴿إنا إلى ربنا منقلبون﴾ نایشترسین ,چونکه بە ڕاستیی ئێمە بۆلای پەروه ردگاری خۆمان دەگەڕێینەوه ﴿٥١ إنا نطمع ان يغفر لنا ربنا خطايانا﴾ بەڕاستیی ئێمە ئومێدەوارین پەروەردگارمان لەگوناهەکانمان خۆش ببێ ﴿ان كنا اول المؤمنين﴾ کەهەربەوه ئێمە یەکەم دەستەین کەپێش" گەلەکەمان بڕوامان هێنا بەمووسا. فیرعەون ئەو هەموو هەڕەشەو گورەشەیە ئەکاو، خوا ئەفەرموێ: ﴿٥٢ واوحينا إلى موسى ان أسر بعبادي إنكم متبعون﴾ وەئێمەش بەمووسا سروشمان کردو تێمانگەیاند: بەندەکانم –ئەوانەی بڕوایان پێت هێناوه– بەشەو بەرەو دەریا ببه، چونکه تاقیبا تتان دەکەن و دواتان دەکەون, تا بتانگێڕنەوەو بتانکوژن ﴿٥٣ فأرسل فرعون في المدائن حاشرين﴾ ئینجا کاتێ دەنگ وباس گەیشتەوه فیرعەون کەمووسا خەڵکەکەی لەشار بردە دەرێ: ئەوسا کۆکەرەوانی بەشارەکانی میسردا نارد تاسوپاولەشکر کۆبکاتەوه"وبڕۆن بەدوایاندا﴿٥٤ إن هؤلاء لشرذمة قليلون﴾ ئەیەوێ سوپاکەی هەڵنێت، بۆیە جاڕی داو وتی: بێگومان ئەوانە دەستەو کۆمەڵێکی کەمن ,زۆر بەئاسانیی ئەیانگرن ﴿٥٥ وإنهم لنا لغائظون﴾ وەبەڕاستی ئەوانە ئێمەیان تووڕەو قەڵسکردووه،﴿٥٦ وإنا لجميع حاذرون﴾ وەبێگومان ئێمە کۆمەڵێکی ئاگاداروو وریاین، بەکورتیی: ئەوانەی لای موسا کۆمەڵێکی هێندك هیچن، ئەتوانین بەئاسانترین شێوه لەناویان بەرین، جاخوا تۆڵەی لە فیرعەون و لەشکرەکەی سەند،و فەرمووی: ﴿٥٧ فأخرجناهم من

﴿جنات وعيون﴾ ئینجا ئێمە بەو شێوەیە فیرعەون و داروودەستەکەیمان وە دەرنا لەناو باخ و باخات و کانیاوەکانیان ﴿٥٨ وكنوز ومقام كريم﴾ وە لەناو خەزنەو دارایی و جێگاو خانووی جوان ە خۆشیاندا ﴿٥٩ كذلك وأورثناها بنى إسرائيل﴾ ئاوا بۆمان وەسف کردی وە دەرمان نان، وە دەسەڵات و داراییەکەیانمان خستە ژێر دەستی نەوەکانی یەعقوب لە دوای ئەوەی نەبوو دیستکورت بوون.

**فیرعەون بەنی ئیسرائیل دەردە پەرێنێ:**

﴿٦٠ فأتبعوهم مشرقين﴾ فیرعەونییەکان هەرگزنگ سەری هەڵدا شوێنیانکەوتن ﴿٦١ فلما تراءا الجمعان﴾ ئینجا کاتێ هەر دوو کۆمەڵەکە یەکتریان چاوکرد ئەوەندە نزیکبوون ﴿قال أصحاب موسى إنا لمدركون﴾ هاوەڵانی موسا وتیان: تازە لەشکرو سوپاکەی فیرعەونمان هەر پێدەگا ﴿٦٢ قال كلا﴾ دڵنیای کردن و پێی وتن: وانیە ئێوە ئەیزانن ﴿إن معى ربى سيهدين﴾ چونکە من پەروەردگارم لەگەڵە ڕێنماییم دەکا بۆ ڕێگای ڕزگار بوون ﴿٦٣ فأوحينا إلى موسى﴾ جا دەست بەجێ نیگامان بۆ موسا کرد ﴿إن اضرب بعصاك البحر﴾ کە بە داردەستەکەت لە دەریادە ﴿فانفلق﴾ ئەویش هەر لێیدا دەریاقەڵشی و لەت بوو ﴿فكان كل فرق كالطود العظيم﴾ و هەرلایەکی وەك کێوێکی گەورەی لێهات، دوازدە ڕێگای لێ بووەوە بە ئەندازەی دوازدە دەستە کەی کورەکانی یەعقووب! ﴿٦٤ وازلفنا ثم الآخرين﴾ ئینجا ئەوانیشمان فیرعەون و لەشکرەکەی -هەرلەوێ" نزیك بە دەریاخستەوە و ڕۆیشتنە ناو دەریاوە بەشوێنیاندا ﴿٦٥ وانجينا موسى ومن معه اجمعين﴾ وە موساوسەرجەم ئەوانەی لەگەڵیا بوون ڕزگارمان کردن و پەڕینەوە لە دەریاکە ﴿٦٦ ثم اغرقنا الآخرين﴾ لەپاشا ئەوادیترمان -فیرعەون و گەلەکەی- نقوم کردو خنکان ﴿٦٧ إن فى ذلك لآية﴾ بێگومان لەو ڕووداوەدا نیشانەیەکی گەورە هەبوو لەسەر ڕاستی ئەوەی مووسا پێی هاتبوو وە پووچەڵی ئەوەی فیرعەون و هۆزەکەی لەسەری بوو ﴿وما كان اكثرهم مؤمنين﴾ لە گەڵ بینینی ئەو نیشانە گەورانە یشدا زۆربەیان هەر بڕوایان نەهێنا و نەگەڕانەوە بۆ لای هەق و ڕاستیی! ﴿٦٧ وإن ربك لهو العزيز الرحيم﴾ وە بێگومان پەروەردگاری دەسەڵاتداری میهرەبانە، بە دەسەڵاتی فیرعەون و سوپاکەی نقوم کردو، بە میهرەبانی مووساو هاوەڵانی ڕزگار کرد.

**هەواڵ و داستانی ئیبراهیم:**

﴿٦٩ واتل عليهم نبأ إبراهيم﴾ هەواڵ و داستانی ئیبراهیمیان بۆ بخوێنەوە ﴿٧٠ إذ قال لأبيه وقومه ما تعبدون﴾ ئەوکاتە کە بە باوکیی و، بەهۆزو نەتەوەکەی خۆیی وت: ئێوە چی ئەپەرستن؟! خۆ دەشزانێ چی ئەپەرستن، بەڵام مەبەستی لیخنکردنی بتەکان لە پێش چاوی ئەوان ﴿٧١ قالوا نعبد أصناما﴾ بە شانازییەکەوە وتیان: ئێمە بتانێك

سُورَةُ الشُّعَرَاءِ الجزء التاسع عشر

فَلَمَّا تَرَٰٓءَا ٱلۡجَمۡعَانِ قَالَ أَصۡحَٰبُ مُوسَىٰٓ إِنَّا لَمُدۡرَكُونَ ٦١ قَالَ كَلَّآۖ إِنَّ مَعِيَ رَبِّي سَيَهۡدِينِ ٦٢ فَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱضۡرِب بِّعَصَاكَ ٱلۡبَحۡرَۖ فَٱنفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ فِرۡقٖ كَٱلطَّوۡدِ ٱلۡعَظِيمِ ٦٣ وَأَزۡلَفۡنَا ثَمَّ ٱلۡأٓخَرِينَ ٦٤ وَأَنجَيۡنَا مُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓ أَجۡمَعِينَ ٦٥ ثُمَّ أَغۡرَقۡنَا ٱلۡأٓخَرِينَ ٦٦ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗۖ وَمَا كَانَ أَكۡثَرُهُم مُّؤۡمِنِينَ ٦٧ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ٦٨ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ إِبۡرَٰهِيمَ ٦٩ إِذۡ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوۡمِهِۦ مَا تَعۡبُدُونَ ٧٠ قَالُواْ نَعۡبُدُ أَصۡنَامٗا فَنَظَلُّ لَهَا عَٰكِفِينَ ٧١ قَالَ هَلۡ يَسۡمَعُونَكُمۡ إِذۡ تَدۡعُونَ ٧٢ أَوۡ يَنفَعُونَكُمۡ أَوۡ يَضُرُّونَ ٧٣ قَالُواْ بَلۡ وَجَدۡنَآ ءَابَآءَنَا كَذَٰلِكَ يَفۡعَلُونَ ٧٤ قَالَ أَفَرَءَيۡتُم مَّا كُنتُمۡ تَعۡبُدُونَ ٧٥ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُمُ ٱلۡأَقۡدَمُونَ ٧٦ فَإِنَّهُمۡ عَدُوّٞ لِّيٓ إِلَّا رَبَّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٧٧ ٱلَّذِي خَلَقَنِي فَهُوَ يَهۡدِينِ ٧٨ وَٱلَّذِي هُوَ يُطۡعِمُنِي وَيَسۡقِينِ ٧٩ وَإِذَا مَرِضۡتُ فَهُوَ يَشۡفِينِ ٨٠ وَٱلَّذِي يُمِيتُنِي ثُمَّ يُحۡيِينِ ٨١ وَٱلَّذِيٓ أَطۡمَعُ أَن يَغۡفِرَ لِي خَطِيٓـَٔتِي يَوۡمَ ٱلدِّينِ ٨٢ رَبِّ هَبۡ لِي حُكۡمٗا وَأَلۡحِقۡنِي بِٱلصَّٰلِحِينَ ٨٣

٣٧٠ وَٱجۡعَل لِّي

ئەپەرستین ﴿فنظل لها عاكفین﴾ بەردەوام هەموو ڕۆژێکیش خەریکی پەرستنی ئەوانین و واین بە دیاریانەوە ﴿٧٢
قال هل یسمعونكم إذ تدعون﴾ ئیبراهیم وتی: ئایا کاتێ هاناو هاواریان بۆ ئەبەن، قسەتان ئەبیستن و، وەڵامتان
ئەدەنەوە؟ ﴿٧٣ أو ینفعونكم أو یضرون﴾ یاخودهیچ کەڵك و زیانێکتان پێ دە گەیەنن؟ ﴿٧٤ قالوا بل وجدنا آباءنا
كذلك یفعلون﴾ وتیان: نەخێر هیچ شتێ لەوە ناکەن، بەڵکو باووباپیرانی خۆمانمان بینیوە هەرئاوایان ئەکرد بۆیە
ئێمەیش ئێستا هەروەك ئەوان ئەکەین ﴿٧٥ قال افرأیتم ما كنتم تعبدون﴾ ئیبراهیم ﷺ وتی: ئاخر ئێوە بیرتان لێ نە
کردووەتەوە، چی دەپەرستن ﴿٧٦ انتم وآباؤكم الأقدمون﴾ خۆتان و، باووباپیرانی پێشینان، ئایا شیاوە بۆ پەرەستن
یان نا؟ ﴿٧٧ فإنهم عدو لی إلا رب العالمین﴾ ئیبراهیم وتی: من بەڕاشکاوی ئەڵێم: بەراستی ئەوانە هەموویان دوژمنی
منن جگەلە پەروەردگاری جیهانەکان ﴿٧٨ الذی خلقنی فهو
یهدین﴾ ئەوەی منی دروست کرد، ئینجا هەرئەویش
شارەزای ڕێگەی بەختیاریم ئەکات ﴿٧٩ والذی هو یطعمنی
ویسقین﴾ هەر ئەو زاتەیە رزق و ڕۆزی بەمن ئەداو، تێر
ئاویشم ئەکات و لەئاسمانەوە باران دەبارێنێ ﴿٨٠ وإذا
مرضت فهو یشفین﴾ کاتێ نەخۆش کەوتم، ئەو شیفام ئەداو
هێزی شیفا هەرئەو دروستی ئەکات ﴿٨١ والذی یمیتنی ثم
یحیین﴾ ئەویشە دەم مرێنێ و، پاشانیش زیندووم دەکاتەوە
﴿٨٢ والذی اطمع أن یغفرلی خطیئتیوم الدین﴾ هەرئەویشە
بەتەمام لەڕۆژی سەڵاو پاداشتدا لەهەڵەو گوناهەکانم ببورێ
ئیبراهیم لەپاش سەناکردنی پەروەردگاری، ئیتر دێتە سەر
مەبەستەکەیی و، داوای چەند شتێکی زۆر گرنگی لێدەکات
﴿٨٣ رب هب لی حكما﴾ ئەی پەروەردگارم! تێگەیشتنی
ڕاست و دروست، زانست و زانیاریی، پێغەمبەریەتیم پێ
ببەخشە ڕێگای خواناسانم پێبناسە ﴿والحقنی
بالصالحین﴾ وە بمگەیەنە بەچاکان. پێغەمبەریش ﷺ
لەکاتی سەرەمەرگەکەیدا سێجار فەرمووی: ((اللهم فی الرفیق
الأعلی)). کاتەکاذیتریش کە بپاڕایەتەوە ئەی فەرموو: ((اللهم أحینا مسلمین، و أمتنا مسلمین، والحقنا بالصالحین
غیر خزایا ولامبدلین)) ئیمامی ئەحمەد ٣/٤٢٤. ﴿٨٤ واجعل لی لسان صدق فی الآخرین﴾ ناوی چاك و شۆرەتێکی
چاکم بخە سەر زاری ئەوانەی لەدوای خۆمەوە دێن تا هەمووکات بە خێر ناوم ببەن و، پەیڕەویم لێبکەن.. بەڵێ
خوای گەورە نزاکەی لێ وەرگرت و، ئێستا تەواوی گەلان بە خێر ناوی ئەبەن، تەنانەت لە نوێژە کانیشدا هەر ناو
دەبرێ ﴿٨٥ واجعلنی من ورثة جنة النعیم﴾ بمگێرە لە میراتگرانی بەهەشتی خۆش و، پڕ لەنازو نیعمەت ﴿٨٦ واغفر
لأبی إنه كان من الضالین﴾ لە گوناهی باوکیشم خۆش ببە، چونکە ئەو لەسەر لێشێواوان بوو، ئیبراهیمﷺ کاتی
خۆی بەڵێنی بەبابی دابوو داوای لێبوردنی بۆ بکات ئەگەر موسڵمان ببێ، هەر بۆیە بۆی پاڕایەوە، بەڵام کاتێکیش
بۆی دەرکەوت دوژمنی خوایە، یەخەی خۆی لێهەڵتەکان و خوایش دۆعاکەی لێوەرنەگرت ﴿٨٧ ولا تخزنی یوم

الجزء التاسع عشر — سورة الشعراء

وَٱجۡعَل لِّی لِسَانَ صِدۡقٍ فِی ٱلۡأٓخِرِینَ ﴿٨٤﴾ وَٱجۡعَلۡنِی مِن وَرَثَةِ جَنَّةِ
ٱلنَّعِیمِ ﴿٨٥﴾ وَٱغۡفِرۡ لِأَبِیٓ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلضَّآلِّینَ ﴿٨٦﴾ وَلَا تُخۡزِنِی یَوۡمَ
یُبۡعَثُونَ ﴿٨٧﴾ یَوۡمَ لَا یَنفَعُ مَالٞ وَلَا بَنُونَ ﴿٨٨﴾ إِلَّا مَنۡ أَتَى ٱللَّهَ بِقَلۡبٖ
سَلِیمٖ ﴿٨٩﴾ وَأُزۡلِفَتِ ٱلۡجَنَّةُ لِلۡمُتَّقِینَ ﴿٩٠﴾ وَبُرِّزَتِ ٱلۡجَحِیمُ لِلۡغَاوِینَ
﴿٩١﴾ وَقِیلَ لَهُمۡ أَیۡنَ مَا كُنتُمۡ تَعۡبُدُونَ ﴿٩٢﴾ مِن دُونِ ٱللَّهِ هَلۡ یَنصُرُونَكُمۡ
أَوۡ یَنتَصِرُونَ ﴿٩٣﴾ فَكُبۡكِبُواْ فِیهَا هُمۡ وَٱلۡغَاوُۥنَ ﴿٩٤﴾ وَجُنُودُ إِبۡلِیسَ
أَجۡمَعُونَ ﴿٩٥﴾ قَالُواْ وَهُمۡ فِیهَا یَخۡتَصِمُونَ ﴿٩٦﴾ تَٱللَّهِ إِن كُنَّا لَفِی
ضَلَٰلٖ مُّبِینٍ ﴿٩٧﴾ إِذۡ نُسَوِّیكُم بِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِینَ ﴿٩٨﴾ وَمَآ أَضَلَّنَآ
إِلَّا ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴿٩٩﴾ فَمَا لَنَا مِن شَٰفِعِینَ ﴿١٠٠﴾ وَلَا صَدِیقٍ حَمِیمٖ ﴿١٠١﴾
فَلَوۡ أَنَّ لَنَا كَرَّةٗ فَنَكُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِینَ ﴿١٠٢﴾ إِنَّ فِی ذَٰلِكَ لَأٓیَةٗۖ وَمَا كَانَ
أَكۡثَرُهُم مُّؤۡمِنِینَ ﴿١٠٣﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلۡعَزِیزُ ٱلرَّحِیمُ ﴿١٠٤﴾ كَذَّبَتۡ
قَوۡمُ نُوحٍ ٱلۡمُرۡسَلِینَ ﴿١٠٥﴾ إِذۡ قَالَ لَهُمۡ أَخُوهُمۡ نُوحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٠٦﴾
إِنِّی لَكُمۡ رَسُولٌ أَمِینٞ ﴿١٠٧﴾ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِیعُونِ ﴿١٠٨﴾ وَمَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ
عَلَیۡهِ مِنۡ أَجۡرٍۖ إِنۡ أَجۡرِیَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِینَ ﴿١٠٩﴾ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ
وَأَطِیعُونِ ﴿١١٠﴾ ۞ قَالُوٓاْ أَنُؤۡمِنُ لَكَ وَٱتَّبَعَكَ ٱلۡأَرۡذَلُونَ ﴿١١١﴾ الربع ٣٨

٣٧١

يبعثون﴾ ڕۆژێ ئەوخەڵکە زیندوو دەکرێنەوە ڕیسواو شەرمەزارم مەکە، دیارە ئەمە ئەوپەڕی (تواضع)و خۆبەکەم زانینە لەلایەن ئەو پێغەمبەرە بەرێزەوە، ئەگینا خۆ خوا ڕێزی لێناوەو براوەتەوە، ئیمامی (بوخاری) لە (ئەبوهورەیرە)وە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((يلقى إبراهيم أباه، فيقول: يارب! إنك وعدتني أن لا تخزني يوم يبعثون. فيقول الله: إني حرمت الجنة على الكافرين)) ئیبراهیم ﷺ لەڕۆژی قیامەتا بەبابی خۆی دەگاو دەبینێ تۆزو گەردێکی زۆری لێنیشتووەو، ڕووی ڕەش داگیرساوە، ئەوجا ئەڵێ پەروەردگاری من! خۆ تۆ بەڵێنت دامێ کە ریسوام نەکەیت؟ خوایش ئەفەرموێ: بەڕاستی من بەهەشتم لەسەر کافران یاساغ کردووە. ﴿[٨٨] يوم لا ينفع مال ولا بنون﴾ ئەو ڕۆژە کە نەماڵ سوود دەداو، نەمنداڵ و کوڕان بە کەڵك دێن ﴿[٨٩] إلا من أتى الله بقلب سليم﴾ مەگەر کەسێ کەبە دڵێکی ساغەوە بێتە حزووری خوا، ساغ بوو بێت لە نەخۆشی شیرك و نیفاق و دووڕوویی و سیفاتی دڕندەیی و ئاژەڵیی، خۆیشی تەنها بەخواوە پەیوەست کردبێ‌و هەر لەگەڵ بەرنامەی ئەودا کاری کردبێت، وە لە مانای (لا إله إلا الله) نەترازابێت، زاناکان پێناسەی (قەلبی سەلیم) ئەکەن: (هو القلب الخالي من البدعة، المطمئن على السنة) بیدعەچی نەبێ‌و، دامەزراوو مەحکەم بێت لەسەر سوننەت و ڕەوشتەکانی پێغەمبەر ﷺ، ئینجا دەست دەکات بەباس کردنی ڕووداوەکانی ئەوڕۆژە سەختە بەم شێوەیە: یەکەم: ﴿[٩٠] وأزلفت الجنة للمتقين﴾ ئەو ڕۆژە بەهەشت بۆ پارێزگاران نزیك ئەخرێتەوە. دووەم: ﴿[٩١] وبرزت الجحيم للغاوين﴾ دۆزەخیش دەخرێتە ڕوو بۆ لاسارو گومڕایان، واتە: بەهەشت دەدرێ بەخواناسان و، دۆزەخیش بە چەوت و چەپەکان. سێیەم:﴿٩٢ وقيل لهم﴾ لەو ڕۆژەدا بەوخەڵکە سەرسەخت و کەللە ڕەقانە ئەوترێ: ﴿أين ماكنتم تعبدون * من دون الله﴾ کوان ئەو بتانەی ئێوە لەباتی خوا ئەتانپەرستن؟ ﴿هل ينصرونكم او ينتصرون﴾ ئایا ئەمڕۆ دەتوانن کۆمەکتان پێ بکەن تا لەسزای خوا ڕزگارتان بکەن, یان یارمەتی دەرێك بۆ خۆیان پەیدا بکەن؟ دیارە هیچیان پێناکرێ،ئەوسا هەموو دەبنە سووتەمەنی دۆزەخ. چوارەم:﴿[٩٤] فكبكبوا فيها هم والغاوون﴾ ئینجا هەمووئەوان و گومڕاکانی تر – پەرستراوو پەرستیارەکان– دەمەوڕوو فڕێ ئەدرێنە ناو دۆزەخەوە ﴿[٩٥] وجنود إبليس أجمعون﴾ هاوڕێ لەگەڵ هەموو سوپاو لەشکرەکانی ئیبلیس"دا. لە سوورەتی (٦٣/١٧),(١٥/٤٣-٤٤)، وهەندێ جێگای دیکەش لەقورئاندا ئەوەپتر ڕوون کراوەتەوە. پێنجەم:﴿[٩٦]قالوا وهم فيها يختصمون﴾ بتپەرستەکان لەناو دۆزەخدا دەست بە دەمە قاڵێ‌و شەڕە قسە ئەکەن وبەرق وکینەوە، ئەڵێن: ﴿[٩٧] تالله إن كنالفي ضلال مبين﴾ سوێند بەخوا! ئێمە لەدونیادا لەسەر لێشێواوییەکی ئاشکرادابووین, بۆیە وا ئێستایش ئاوامان بەسەر هات ﴿[٩٨] إذ نسويكم برب العالمين﴾ کەئێوەمان (ئەی بتەکان!) لەگەڵ پەروەردگاری جیهانەکاندا, یەکسان وەکویەك دەپەرست,جا وا ئەمڕۆیش ئێوە ناتوانن هیچ شتێکمان بۆ بکەن! وەك دەفەرموێ: (إنا كنا لكم تبعا فهل أنتم مغنون عنا من عذاب الله من شئ) (٢١/١٤). ﴿[٩٩] وما أضلنا إلا المجرمون﴾ وە تەنها سەرکردە تاوانبارەکان بوون سەریان لێ شێواندین. واتە کاتێ کەسەرکردەو بتەکان بەبێ دەسەڵات ئەبینن, ئەوجا ئەکەونە شەڕەدەم و پتر بەدبەختی خۆیان دەرئەبڕن و ئەڵێن:﴿[١٠٠] فما لنا من شافعين﴾ وائێستاش هیچ تکاکارێکمان نیە ,تا تکامان بۆ بکاولەوتەنگەژەیە ڕزگارمان ببێ ﴿[١٠١] ولا صديق حميم﴾ وەهیچ دۆستێکی نزیك و دڵگەرم و بەسۆزیشمان نیە، بتوانێ یارمەتیەکمان بدات ﴿[١٠٢] فلوأن لنا كرة فنكون من المؤمنين﴾ خۆ ئەگەر تەنها جارێ، گەڕانەوەمان بۆ دونیا دەبوو, ئەوسا لەبڕواداران دەبووین، بۆئەوە دووچاری ئەم سزایە نەبین, وەك ئەفەرموێ: (إن ذلك لحق تخاصم أهل النار) ٣٨/٦٤. ﴿[١٠٣] إن في ذلك لآية﴾ بەڕاستیی لەوداستانەی ئیبراهیم لەگەڵ گەلەکەیدا، سەبارەت بە دەسەڵات و بوونی خوا.. بەڵگەیەکی زۆر گەورەهەیە لەسەر

بوون و یەکتایی‌خواو هاتنی‌دوا ڕۆژ ﴿وماكان اكثرهم مؤمنين﴾کەچی لەگەڵ ئەوەیشدا زۆربەی هۆزەکەی باوەڕناکەن و لەسەر بێ باوەڕی خۆیان سوورن! ﴿١٠٤ وإن ربك لهو العزيز الرحيم﴾ بێگومان هەرپەروەردگارت بەتوانایە لەسەر تۆڵە کردنەوە لەتاوانباران, زۆریش میهرەبان و دڵاویە بەرامبەر بەباوەڕداران، جاکەواتە تۆش ئەی موحەممەد ﷺ غەمگین و دڵ زویر مەبە لەگەلەکەی خۆت،چونکە ئەمە سوننەتی خوایە.

### داستانی نووح و گەلەکەی:

ئینجا دوای داستانی ئیبراهیم, دێتە سەرداستانی باوکی دووەمی ئادەمیزاد ,پیری پێغەمبەران(نووح) عليه السلام: بۆیە دەفەرموێ: ﴿١٠٥ كذبت قوم نوح المرسلين﴾ هۆزی (نووح)یش ,پەیامبەرانیان بەدرۆ خستەوەو، بڕوایان پێ نەهێنان. بەڵێ.. هەرچەندە تەنها لەگەڵ نوح دا ڕووبەڕوو بوونەوەو بەدرۆیان خستەوە، بەڵام وەك لەگەڵ گشت پەیامبەراندا جەنگابن وایە، بۆیە فەرمووی: (كذبت قوم نوح المرسلين). ﴿١٠٦ إذ قال لهم أخوهم نوح الا تتقون﴾ ئەو دەمەی نووحی برای بنەچەییان پێگوتن:ئایا ئێوە لەخوا ناترسن، لەپەرستنی بتان پارێزناکەن؟! ﴿١٠٧ إني لكم رسول امين﴾ ئەوسا نووح دووشتیان پێ ئەڵێ، یەکەم: بێگومان من نێرراوێکی ئەمینم بۆتان،واتە: لەلایەن خواوە هەرچیم پێ سپێرراوە بێ زیادو کەم پێتان رائەگەیەنم" ﴿١٠٨ فاتقوا الله واطيعون﴾ جا کەواتە لەخوا بترسن و، گوێرایەڵی منیش بکەن لەوەی فەرمانتان پێدەدەم.دووەم: ﴿١٠٩ وما أسألكم عليه من اجر﴾ لەجێ بەجێ کردنی ئەو ئەرکەشمدا داوای هیچ کرێ و مزیەکتان لێ ناکەم ﴿إن اجرى إلا على رب العالمين﴾ پاداش و کرێی من هەر لە سەر پەروەردگاری جیهانەکانە ﴿١١٠ فاتقوا الله واطيعون﴾ دەسا بەردەوام لەخوا بترسن، گوێرایەڵی منیش بکەن. ﴿١١١ قالوا انؤمن لك﴾ جاکە هیچیان پێ نەما بەنوحیان وت:ئایا ئێمە بڕوا

الجزء التاسع عشر | سورة الشعراء

قَالَ وَمَا عِلْمِى بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١١٢﴾ إِنْ حِسَابُهُمْ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّى
لَوْ تَشْعُرُونَ ﴿١١٣﴾ وَمَآ أَنَا۠ بِطَارِدِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١١٤﴾ إِنْ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ
﴿١١٥﴾ قَالُوا۟ لَئِن لَّمْ تَنتَهِ يَٰنُوحُ لَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمَرْجُومِينَ ﴿١١٦﴾ قَالَ
رَبِّ إِنَّ قَوْمِى كَذَّبُونِ ﴿١١٧﴾ فَٱفْتَحْ بَيْنِى وَبَيْنَهُمْ فَتْحًا وَنَجِّنِى وَمَن
مَّعِىَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١١٨﴾ فَأَنجَيْنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ فِى ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ
﴿١١٩﴾ ثُمَّ أَغْرَقْنَا بَعْدُ ٱلْبَاقِينَ ﴿١٢٠﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً ۖ وَمَا كَانَ
أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٢١﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٢٢﴾ كَذَّبَتْ
عَادٌ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٢٣﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ هُودٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٢٤﴾ إِنِّى لَكُمْ
رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٢٥﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٢٦﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ
مِنْ أَجْرٍ ۖ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٢٧﴾ أَتَبْنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ
ءَايَةً تَعْبَثُونَ ﴿١٢٨﴾ وَتَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ لَعَلَّكُمْ تَخْلُدُونَ ﴿١٢٩﴾
وَإِذَا بَطَشْتُم بَطَشْتُمْ جَبَّارِينَ ﴿١٣٠﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٣١﴾
وَٱتَّقُوا۟ ٱلَّذِىٓ أَمَدَّكُم بِمَا تَعْلَمُونَ ﴿١٣٢﴾ أَمَدَّكُم بِأَنْعَٰمٍ وَبَنِينَ ﴿١٣٣﴾
وَجَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٣٤﴾ إِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ
﴿١٣٥﴾ قَالُوا۟ سَوَآءٌ عَلَيْنَآ أَوَعَظْتَ أَمْ لَمْ تَكُن مِّنَ ٱلْوَٰعِظِينَ ﴿١٣٦﴾

إِنْ هَٰذَآ إِلَّا | ٣٧٢

بەتۆ بێنین؟! ﴿واتبعك الأرذلون﴾ لەحاڵێکدا خەڵکانێکی پەست و قسە نەزان و هەژار بە دوواوەتەن؟. لەسوورەتی (٢٧/١١)دا: (وما نراك اتبعك إلا الذين هم أراذلنا..) هاتووە، کەبێ باوەڕانی (قورەیش)یش هەر هەمان ڕەخنەیان لەمحمد ﷺ گرت. ﴿١١٢ قال وما علمى بما كانوا يعملون﴾ نووح وتی: خۆمن عیلم وئاگام نیە ئەوان چ کارێکیانکردووە؟!واتە: من نازانم پێیشەو ئیشیان چی بووە؟ چونکە من بڕوام ویست لێیان، ئەوانیش وەڵامیان دامەوە و بڕوایان هێنا. ﴿١١٣ إن حسابهم إلا على ربى لو تشعرون﴾ لێکۆڵینەوە-لەکارو ئیشەکانیان- هەر بۆ پەروەردگارمە.. ئەگەر هەست دەکەن ﴿١١٤ وما انا بطارد المؤمنين﴾ وەهەرگیز من دوور خەرەوەی بڕواداران نیم وەك ئێوە داوا ئەکەن,ئیدی حاڵیان هەر چۆن بێ لەهەژاریی و دۆڵەمەندی.ئایەتی (وما انا بطارد الذين آمنوا) (٢٠/١١), وە (٥٢/٦) وە (٢٨/١٨) هەر بۆ پشتگیری هەمان مەبەستە. ﴿١١٥ إن انا إلا نذير مبين﴾ وە من هەر ترسێنەرێکی

ئاشکرام بۆئێوە, بێجیاوازی لە نێوان دەوڵەمەندو هەژاردا ﴿[١١٦] قالوا لئن لم تنته یا نوح﴾ کاتێ بێ هیوا بوون,کە نووح لەکارەکەی خۆی دەس هەڵبگرێ.. وتیان: ئەی نووح! ئەگەر واز لەم جۆرە قسانە نەهێنێ ﴿لتکونن من المرجومین﴾ بێگومان لەبەردبارانکراوان دەبیت, واتە: بەردبارانت ئەکەین: نوحیش کە ئەوەی بیست، ئیتر تەماح بڕ بوو لێیان، بۆیە:﴿[١١٧] قال ربی إن قومی کذبون﴾ وتی: پەروەردگارم! خۆت ئاگاداری, هۆزەکەم بڕوایان پێ نەکردم وبەدرۆیان خستمەوە!. لەسوورەتی (٧١/٥-٧)وە(١٠/٥٤)دا هەمان ماناوەبەست هەیە. ﴿[١١٨] فافتح بینی وبینهم فتحا﴾ جا تۆلەنێوان من و ئەواندا, بڕیارێکی تەواو بدەو, لەیەکمان جیابکەرەوە ﴿ونجنی ومن معی من المؤمنین﴾ وەخۆم وئەو بڕوادارانەی لەگەڵمدان, ڕزگار بکە﴿فأنجیناه ومن معه فی الفلك المشحون﴾ ئینجا نوح و ئەوانەی لەگەڵی بوون لەکەشتیە پڕەکەدا ڕزگارمان کردن. لە سوورەتی (١٥/٢٩):دا (فأنجیناه وأصحاب السفینة..) هەرجەخت لەسەر ئەو مانایە دەکاتەوە. ﴿[١٢٠] ثم اغرقنا بعد الباقین﴾ لەپاشان ئەوانەش وامانەوە نقوممان کردن. لەسوورەتی (١٤/٢٩)وە(٣٧/١١)یشدائەو مانایە روونکراوەتەوە. ﴿[١٢١] إن فی ذلك لآیة﴾ بەڕاستیی لەوەشدا بەڵگەی زۆر گەورەهەیە,لەسەر ڕاستی پێغەمبەران وتوانایی خوا ﴿وماکان اکثرهم مؤمنین﴾ بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا, زۆربەی هۆزەکەت هەر بڕوا ناهێنن ﴿[١٢٢] وإن ربك لهو العزیز الرحیم﴾ بێگومان پەروەردگارت هەر ئەو زاڵ و بەتوانایە -ئاوا ئەکات بەستەمکاران کە کردی- زۆر میهرەبان و بە بەزەییشە لەگەڵ خواناساندا. ئینجا بۆدڵ قایمکردنی پەیامبەرﷺ لەسەر ئیشەکەی باسی هۆزی (هوود)یش -سڵاوی لەسەربێ- ئەکا: ﴿[١٢٣] کذبت عاد المرسلین﴾ هۆزی (عاد)یش هەموو پەیامبەران و (هوود)یشیان بە درۆزن دانا، واتە بەدرۆزن زانینی هوود، بڕوا نەکردنە بەهەموان. ﴿[١٢٤] إذ قال لهم أخوهم هود ألا تتقون﴾ ئەو دەمەی کە هوودی برایان-لەبنەچەدا- پێیگوتن: ئایا ئەوە ئێوە لە خوا شەرم ناکەن و، لێی ناترسن؟! ﴿[١٢٥] إنی لکم رسول امین﴾ بەڕاستیی من نێرراوێکی ڕاست و ئەمینم بۆتان ﴿[١٢٦] فاتقوا الله واطیعون﴾ جا کەوایە لە خوا بترسن و، بەگوێی منیش بکەن ﴿[١٢٧] وما أسألکم علیه من أجر﴾ و من هیچ کرێ و پاداشێکملەسەر گەیاندنی پەیامەکەمدا, لەئێوە ناوێ ﴿إن أجری إلا علی ربی العالمین﴾ بەڵکو مزەو پاداشتم هەر لە سەر پەروەردگاری جیهانەکانە. بەڵێ.. ئەم پێغەمبەرە بەڕێزانە (نووح، هوود، صالح، لووط، شوعەیب) عليهم السلام ئەم هەقیقەتەیان- مزەو کرێمان لەئێوە ناوێ - هەموو وەك یەك ڕاگەیاند..ئەمەش بەڵگەیە بۆ ئەوە کەپێغەمبەران هەر هەموو یەك بەرنامەیان هەبووە ﴿[١٢٨] اتبنون بکل ریع آیة تعبثون﴾ هوود پاش ئەوە لەمەبەستەکەی بوویەوە.. پێیان ئەڵێت: ئایا ئێوە لە هەمووجێگایەکی بەرزو بڵند - بەبێ پێویست- بەڵکو لەڕووی هەواو ئارەزوو وخۆنواندن و یاریی و لاقرتی و نیشاندانی دەسەڵات بەسەر خەڵکیدا, ساختمانی گەورەگەورە دروس دەکەن؟ ﴿[١٢٩] وتتخذون مصانع لعلکم تخلدون﴾ وەکۆشك و قەڵای زۆر مەحکەم و حەوزی گەورە گەورە ساز ئەدەن؟ وا دەزانن کە هەمیشە دەمێننەوەو دەژین. (الریع: ما ارتفع من الأرض، جمع ریعة، یقال: کم ریع ارضك؟ اي: کم إرتفاعها، قال قتادة: الریع: الطریق. ﴿[١٣٠] وإذا بطشتم﴾ هەرکات پەلامارو هەڵمەتیش بەرن بۆ تۆڵە وەرگرتنەوە ﴿بطشتم جبارین﴾ بەشێوەیەکی زۆر دارانەو بێ بەزەییانە,هێرش و هەڵمەت دەبەن! ﴿[١٣١] فاتقوا الله واطیعون﴾ جا لەخوا بترسن و شەرم بکەن و گوێڕایەڵی منیش بکەن ﴿[١٣٢] واتقوا الذی أمدکم بما تعلمون﴾ وقلەو خوایە بترسن کەخۆتان ئەزانن چیپێداون.

**هوودو عادی قەومی:**

لەم چەند ئایەتەشدا خوای میهرەبان گەلێ لەو نیعمەتانەی دای بە نەتەوەکەی هوود دەخاتە ڕوو: ﴿[١٣٣] أمدكم بأنعام وبنين * وجنات وعيون﴾ مالاَت و کوران و باخات و، کانیاوو ڕووبارو جۆگەی زۆری پێبەخشین (ئەی هۆزی هوود!)، دەحەق نیە کە لەوخوایە شەرم بکەن؟﴿[١٣٥] إني أخاف عليكم عذاب يوم عظيم﴾ بەڕاستیی من ئەترسم ئێوە دووچاری سزای ڕۆژێکی گەورە بین ,ئەگەر بەردەوام بن لەسەر بێ بڕواییتان, دیارە هوود بەردەوام هەر ئامۆژگاریانی کرد، ئەوانیش لە وەلاما: ﴿[١٣٦] قالوا سواء علينا اوعظت ام لم تكن من الواعظين﴾ وتیان: لای ئێمە یەکسانە ئامۆژگاری بکەیت، یا نەیکەی؟! "ئێمە گرنگی نادەینێ و مەبەستمان نیەو لێت وەر ناگرین" ﴿[١٣٧] إن هذا إلا خلق الأولين﴾ چونکە ئەم ئایینەی کە تۆ هێناوتە, جگە لە درۆودەلەسەی پێشینان نەبێ,شتێکی تر نیە ﴿[١٣٨] وما نحن بمعذبين﴾ و ئێمە هەرگیز سزا دراو نابین وەك تۆ ئەڵێی.

﴿[١٣٩] فكذبوه فأهلكناهم﴾ جابەدرۆیان خستەوەو (بڕوایان پێ نەهێنا) ئێمەیش لەناومان بردن,ئەوەبوو (با)یەکی زۆر ساردی کوشندەمان بۆ هەڵکردن و لەڕیشەی هێنان ﴿إن في ذلك لآية﴾ بەڕاستیی لەو دەست وەشاندنەدا بەڵگەی زۆر گەورە هەیە بۆ دەسەلاَتمان ﴿وما كان اكثرهم مؤمنين﴾ کەچی هەر زۆربەی هۆزەکەت(ئەی پێغەمبەر!) باوەڕ ناهێنن ﴿[١٤٠] وإن ربك لهو العزيز الرحيم﴾ بەڕاستیی پەروەردگارت زۆر بەدەسەلاَتە ,ئاوا ئەکات بەدوژمنان کە کردی, میهرەبانیشە بۆ دۆستانی خۆی.

سُورَةُ الشُّعَرَاءِ — الجُزْءُ التَّاسِعَ عَشَرَ

إِنْ هَٰذَآ إِلَّا خُلُقُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٣٧﴾ وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴿١٣٨﴾ فَكَذَّبُوهُ فَأَهْلَكْنَٰهُمْ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَءَايَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٣٩﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٤٠﴾ كَذَّبَتْ ثَمُودُ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٤١﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ صَٰلِحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٤٢﴾ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٤٣﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٤٤﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٤٥﴾ أَتُتْرَكُونَ فِي مَا هَٰهُنَآ ءَامِنِينَ ﴿١٤٦﴾ فِي جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٤٧﴾ وَزُرُوعٍ وَنَخْلٍ طَلْعُهَا هَضِيمٌ ﴿١٤٨﴾ وَتَنْحِتُونَ مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا فَٰرِهِينَ ﴿١٤٩﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٥٠﴾ وَلَا تُطِيعُوٓا۟ أَمْرَ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿١٥١﴾ ٱلَّذِينَ يُفْسِدُونَ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ ﴿١٥٢﴾ قَالُوٓا۟ إِنَّمَآ أَنتَ مِنَ ٱلْمُسَحَّرِينَ ﴿١٥٣﴾ مَآ أَنتَ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا فَأْتِ بِـَٔايَةٍ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١٥٤﴾ قَالَ هَٰذِهِۦ نَاقَةٌ لَّهَا شِرْبٌ وَلَكُمْ شِرْبُ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴿١٥٥﴾ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابُ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٥٦﴾ فَعَقَرُوهَا فَأَصْبَحُوا۟ نَٰدِمِينَ ﴿١٥٧﴾ فَأَخَذَهُمُ ٱلْعَذَابُ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَءَايَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٥٨﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٥٩﴾

٣٧٣

**ساڵح و سەمودی قەومی:**

دوای چیرۆکی (عاد وهوود)، باسی داستانی گەلی (سەموود)یش دەکا و، ئەفەرموێ: ﴿[١٤١] كذبت ثمود المرسلين﴾ هۆزی سەموود (صالح)یان بەدرۆزن دانا و بڕوایان پێ نەهێنا , بەدرۆزن زانینیپێغەمبەرێك, وەك بەدرۆزن زانینی هەموو پەیامبەرانیان وایە ﴿[١٤٢] إذ قال لهم اخوهم صالح الا تتقون﴾ ئەوکاتەی کە صاڵحی برایان- لەبنەچەدا- پێیگوتن: ئەرێ ئێوە لەخوا ناترسن؟! ﴿[١٤٣] إني لكم رسول امين﴾ بێگومان من پەیامبەرێکی ئەمین و دەست پاکم بۆتان ﴿[١٤٤] فاتقوا الله واطيعون﴾ جا کەواتە لە خوا بترسن و, گوێڕایەڵی منیش بکەن، چونکە من نێرراوی ئەوم بۆ لای ئێوە و هەر لەخۆێشتانم ﴿[١٤٥] وما اسألكم عليه من اجر﴾ وە لە سەر ڕاگەیاندنی پەیامەکەم هیچ کرێ و مزەیەکتان لێ داوا ناکەم ﴿إن اجري إلا على رب العالمين﴾ کرێ و پاداشم تەنها لەسەر پەروەردگاری جیهانەکانە. ئینجا بە چەند شتێك ئەیانترسێنێ کە ئەگەر لاسار بن، دەرەنجام خوا قاریان لێ دەگرێت، یەکەم: ﴿[١٤٦] أتتركون فيما ههنا آمنين * في جنات وعيون﴾ ئایا ئێوە پێتان وایە هەر ئاوا لەم دونیایەدا بەخۆشی و بێ ترس لە سزا، وە لەناو ئەم باخ و باخات و کانیاوەدا دەمێننەوە و"ڕادەبوێرن" ﴿[١٤٨] وزروع ونخل طلعها هضيم﴾ و کشتوکاڵ

و باخە خورمای خاوەن –بەرشیرین و،شکۆفە نەرم و ناسك و بەتامدا؟! دیارە ولاتی سەموود، ولاتێکی پڕ لەکانیاو وبـاخ و جۆرەهـا میـوەو درەخـت بـووە. دووەم: ﴿[١٤٩] وتنحتـون مـن الجبـال بیوتـا فـارهین﴾ وە بەخۆشییوشادەمانی لەکێوەکان خانوو شوێنیخۆش دە تاشن. گەلی صالح –عليه السلام– زۆر حەزیان لەماڵ وخانووی جوان و، خۆراکی خۆش و رابواردن بووە، وە تەمەنیشیان زۆر درێژ بووە. تەفسیری (صاویی) ئەڵێت: هی وایان هەبووە، سێسەد ساڵ، تا هەزار ساڵ ژیاوە ﴿[١٥٠] فاتقوا الله واطیعون﴾ جا لەخوا بترسن و گوێڕایەڵی منیش بکەن ،چاکیش بزانن کە من هەر خێری ئێوەم ئەوێ، دەمەوێ خوا قارتان لێ نەگرێ. سێیەم:﴿[١٥١] ولا تطیعوا أمر المسرفین﴾ وە بە فەرمانیهەڵەڕۆو لەسنووردەرچووەکان مەکەن ﴿[١٥٢] الذین یفسدون فی الأرض ولا یصلحون﴾ ئەوانەی لەزەوییدا فەسادو خراپە ئەکەن و، هەرگیز هەوڵی چاك سازیی نادەن، مەبەست بەمانە , ئەو نۆ دەستەیە کە خوا ئەفەرموێ: (وکان فی المدینة تسعة رهط یفسدون فی الأرض ولا یصلحون) ٤٨/٢٧.. ﴿[١٥٣] قالوا إنما انت من المسحرین﴾ کاتێ یەکیانکەوت و هیچیان بۆ نەمایەوە,کەوتنە گومان دروستکردن لەدڵی خەڵکەکەداو وتیان: بەڕاستیی تۆ –ئەی صالح!– ببێ و نەبێ دەستت جادووت لێکراوەو، ئەقڵ و ژیریت لەدەستداوە، جا لەبەر ئەوەقسەەتۆ, لای ئێمە بێ نرخەو رەواجی نیە ﴿[١٥٤] ماانت إلا بشر مثلنا﴾ تۆش هەر مرۆیەکی وەکو ئێمە ,لەوە بەولاوە شتێکی تر نیت، ئیتر چۆن بڕوات پێ بکەین وەحیت بۆ هاتووە؟! ﴿فأت بآیة إن کنت من الصادقین﴾ دە ئەگەر شێت نیت و، لەڕاستبێژانی بەڵگەیەکمان بۆ بێنە کە راستی تۆ بسەلمێنێ ﴿[١٥٥] قال هذه ناقة﴾ وتی: ئەمە وشترێکەو، مۆجیزەی منە بۆتان.

(ئیبن کەسیر) ئەڵێ: داوایان لەصالح کرد عليه السلام لە بەردێکی رەق و تەق وشترێ بێتە دەرێ و، هەر خێراش بەچکەیەکی ببێ،ئەوسا (صالح)یش عليه السلام پەیمانی لێ وەرگرتن کە: پاش ئەوە دەبێ بڕوا بێنن، ئەوانیش قبووڵیان کرد، ئیتر (صالح)یش عليه السلام لەخوا پاڕایەوە بۆ جێبەجێ بوونی داواکەیان، پاشان ئەو بەردەی ئەوان دەست نیشانیان کردبوو لەت بوو و، ئەو وشترەی لێهاتە دەرێ، کەچی زۆربەیان باوەڕیان هەرنەهێناو، ئەوەش قسەیان بوو!. ﴿لها شرب ولکم شرب یوم معلوم﴾ بۆخۆی بەشەئاوی خۆیهەیە،بۆ ئێوەیش بەشە ئاوی رۆژێکی دیاری کراوتان هەیە، بەڵێ ئەو رۆژە کە وشترەکە نۆرە ئاوی ئەو بوایە بەتەنها خۆی ئاوەکەی ئەخواردەوە، ئیتر لەسەرە ئاوی خەڵکەکەدا نزیک نە دەبوویەوە ﴿[١٥٦] ولا تمسوها بسوء﴾ دەستیشی بۆ مەبەن و هیچ جۆرە زیانێکی پێ مەگەیەنن , نە پەیکردنی و نەلێدانی ﴿فیأخذکم عذاب یوم عظیم﴾ دەنا سزای رۆژێکی گەورە یەخەتان ئەگرێت ﴿[١٥٧] فعقروها﴾ کەچی قسەکەی صاڵحیان شکاندو، وشترەکەیان پەیکردو کوشتیان ﴿فاصبحوا نادمین﴾ دوایش لەکارەکەیان پەشیمان بوونەوە ﴿[١٥٨] فاخذهم العذاب﴾ بەلام پەشیمانی لەو کاتەدا بێ کەڵکە، ئینجاخێرا سزای خوا دەرگای پێگرتن ,ئەوەبوو لە ژێرپێیانەوە زەویی لەرزە گرتنی و، لەسەرووشیانەوە بەردەبارانکران وقڕیان تێکەوت ﴿إن فی ذلك لآیة﴾ بێگومان لەودەست وەشانەدا بەڵگەیەکی گەورە هەیە بۆ دەسەلات و قاری خوا ﴿وما کان اکثرهم مؤمنین﴾ کەچی هێشتای زۆربەی هۆزەکەت (ئەی پێغەمبەر!) باوەڕ ناهێنن! ﴿[١٥٩] وإن ربك لهو العزیز الرحیم﴾ وە بەڕاستیی پەروەردگاری تۆ زاڵ و بەتوانایە، هەرچی ئەکات ئەیکات و، دڵاوا میهرەبانیشە بەرامبەر بەصاڵحان و راسالان.

**داستانەکەی لووت و قەومەکەی:**

ئەمە لەخوارەوە دێت هەواڵ وبەسەرهاتی هۆزەکەی (لووتی کوڕی هارانی کوڕی ئازەری) برازای ئیبراهیمی خەلیلە، هەر لەسەردەمی ئیبراهیمدا خوا(لووط)ی کردە پێغەمبەرو ناردی بۆ ئەوهۆزە گەورەیە کەلە (سەدووم)وشارەکانی دەوروبەرییدا ئەژیان و، دەرەنجامیش خوا لەناوی بردن و، جێگاکەیانی کردە دەریاچەیەکی بۆگەنی فاسیدو خراپ و نێو بانگی بە (شارە وێران بووەکان) دەر کرد, ئەوشوێنەش لەنزیکی(بیت المقدس)ودەوروبەری (عومان) وشارەکانی(کەرەك)ی شامدایە. ﴿١٦٠ كذبت قوم لوط المرسلين﴾ هۆزی (لوط) هەموو پەیامبەرانیان بەدرۆزن داناو، بڕوایان پێ نەهێنان واتە: بڕوا نەهێنانیان بەلوط وەك هەموو پێغەمبەران بەدرۆ خرابنەوە وایە ﴿١٦١ إذ قال لهم اخوهم لوط الا تتقون﴾ کاتێ کە لووتی برایان لە بنەچەدا پێی وتن: ئەرێ ئێوە لە خوا ناترسن و، تەقیەی ناکەن ﴿١٦٢ إنی لکم رسول امین﴾ بێگومان من پەیامبەرێکی دەست پاك و دڵسۆزو ئەمینم بۆتان ﴿١٦٣ فاتقوا الله واطيعون﴾ جا لەخوا بترسن و، فەرمانی منیش جێ بەجێ بکەن ﴿١٦٤ وما اسألكم عليه من اجر﴾ وە من داوای هیچ جۆرە مزەو پاداشتێکتان لێ ناکەم لە بەرامبەر راگەیاندنی پەیامەکەمدا ﴿إن اجری إلا علی رب العالمین﴾ کرێ و پاداشی من هەر لەسەر پەروەردگاری جیهانەکانە، ئیتر هیچم لەئێوە ناوێ، ئەوە نەبێ کە گوێم بۆ رابگرن. ئینجا سەرزەنیشتیان ئەکات لەسەر داهێنانی ئەو کارە ناشیرینەیان و پێ ناخۆش بوون و بێزاری خۆی دەرئەبڕێ بەرانبەریی و ئەڵێ:﴿١٦٥ اتأتون الذكران من العالمين﴾ ئەرێ لەناو ئەوهەموو خەڵکەدا ئێوە دەڕۆنە لای نێرەکان و، ئارەزووتان لەگەڵ ئەواندا جێبەجێ بکەن ﴿١٦٦ وتذرون ما خلق لكم ربكم من ازواجكم﴾ وە خێزان و هاو لوفی خۆتان کەخوا بۆی دروست کردوون وەلا دەنێن!

﴿بل انتم قوم عادون﴾ بەڵکو ئێوە هەر گەلێکی زۆر دەست درێژکەرو نارەسەن و سەرکەشن ﴿١٦٧ قالوا لئن لم تنته یا لوط لتکونن من المخرجين﴾ کاتێ کە هیچیان پێ‌نەما! کەوتنە هەڕەشەو وتیان: ئەی لوط! ئەگەر واز لەم قسانە نەهێنی سووربزانە لەدەرکراوان ئەبی واتە: شار بەدەرت ئەکەین ﴿١٦٨ قال إنی لعملکم من القالين﴾ لوط وتی: بەڕاستیی من قەڵس و بێزارم لە کارو کردەوەتان ﴿١٦٩ رب نجنی واهلی مما یعملون﴾ لووت نزای لێیان کردو وتی: ئەی پەروەردگارم! خۆم و ماڵ و خێزانم "لەسزای" ئەو ئاکارەی ئەوان ئەیکەن ڕزگار بکە ﴿١٧٠ فنجيناه واهله اجمعين﴾ خواش نزاکەی وەرگرت و فەرمووی: ئێمەش لوت و خێزانیمان هەموویان لەو سزایە کە هاتە سەریان ڕزگار کرد ﴿١٧١ إلا عجوزا فی الغابرين﴾ تاقە پیرەژنێك نەبێت ژنەکەی لووط ئەو لەناویاندا نەبێت مایەوەو تیاچوو، چونکە ئافرەتێکی بەدکارو خراپ بوو، بڕوای بەلوت نەهێناو لەگەڵی دەرنەچوو وەك لەسوورەتەکانی: (أعراف) و



كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ ٱلْمُرْسَلِينَ ١٦٠ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ لُوطٌ أَلَا تَتَّقُونَ
١٦١ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ١٦٢ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ١٦٣ وَمَآ
أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ١٦٤
أَتَأْتُونَ ٱلذُّكْرَانَ مِنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ١٦٥ وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُم
مِّنْ أَزْوَٰجِكُم بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ عَادُونَ ١٦٦ قَالُوا۟ لَئِن لَّمْ تَنتَهِ يَٰلُوطُ
لَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُخْرَجِينَ ١٦٧ قَالَ إِنِّى لِعَمَلِكُم مِّنَ ٱلْقَالِينَ ١٦٨
رَبِّ نَجِّنِى وَأَهْلِى مِمَّا يَعْمَلُونَ ١٦٩ فَنَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ أَجْمَعِينَ ١٧٠
إِلَّا عَجُوزًا فِى ٱلْغَٰبِرِينَ ١٧١ ثُمَّ دَمَّرْنَا ٱلْءَاخَرِينَ ١٧٢ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم
مَّطَرًا فَسَآءَ مَطَرُ ٱلْمُنذَرِينَ ١٧٣ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم
مُّؤْمِنِينَ ١٧٤ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ١٧٥ كَذَّبَ أَصْحَٰبُ
لْـَٔيْكَةِ ٱلْمُرْسَلِينَ ١٧٦ إِذْ قَالَ لَهُمْ شُعَيْبٌ أَلَا تَتَّقُونَ ١٧٧ إِنِّى لَكُمْ
رَسُولٌ أَمِينٌ ١٧٨ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ١٧٩ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ
مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ١٨٠ ۞ أَوْفُوا۟ ٱلْكَيْلَ وَلَا
تَكُونُوا۟ مِنَ ٱلْمُخْسِرِينَ ١٨١ وَزِنُوا۟ بِٱلْقِسْطَاسِ ٱلْمُسْتَقِيمِ ١٨٢
وَلَا تَبْخَسُوا۟ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ١٨٣

(هود) و (حیجر)دا هاتووه. ﴿١٧٢ ثم دمرنا الآخرين﴾ لەپاشا خەڵکەکەی‌ترمان ئەوانەی شوێنی لوط نەکەوتن قڕ تێخست و بەتوندی فەوتاند ﴿١٧٣ وامطرنا عليهم مطرا﴾ وە بەسەختی وەك لێزمەی باران بەرد بارانمان کردن ﴿فساء مطر المنذرين﴾ چ بارانێکی خراپ و بەد بوو بارانی ترسێنراوەکان ﴿١٧٤ إن فى ذلك لآية وماكان اكثرهم مؤمنين * ١٧٥ وإن ربك لهو العزيز الرحيم﴾ ئەو دوو ئایەتە لە پێشترەوە چەند جاری‌تر راڤەمان کردوون.. بگەڕێرەوە بۆی.

(مەراغیی) ئەڵێت: دکتۆر (ئۆلبرایت) هەڵسا بەچەند تاقیکردنەوەیەك لە دۆڵ و شیوەکانی (ئوردون) و دەوروبەری دەریای مردوو (البحر الميت — بحيرة لوط)دا، بۆ ئەوەی بۆی رۆشن بێتەوە: ئایا ڕاستە سەدوم وعمورە و سێ شارەکەی‌تر کە لەسەردەمی لوطدا تیاچوون لەوێدا بوون؟ جادوای لێکۆڵینەوەکەی بڕیاریدا: بەڵێ ئەو شارە کاولکراوانە لەوێ بوون، ئەمەیش شتێکی تازە ڕووداوو ناوازە نیيە، بەڵکو گەلێ جار زەمین لەرزەو تەقینەوەی زەویی ڕوویداوە، کە چەندەها شارو شارۆچکەی وێران کردووە هەروەکو ئێستایش زۆر هەیە.

**شوعەیب و خاوەن دەحلانەکەی:**

﴿١٧٦ كذب أصحاب الأيكة المرسلين﴾ ئەمەیش چیرۆك و داستانی شوعەیب و ﷺ خاوەنانی باخە چڕو پڕەکە (أصحاب الأيكة)یە کە لەنزیك شاری (مەدیەنە)وە دەژیان، هەموویان پەیامبەرانیان بەدرۆزن داناو بڕوایان پێ نەهێنان، دیارە لێرەیشدا مەبەست تەنها شوعەیبە ﷺ. (الأيك: الشجرالملتف الكثير، واحده: ايكة) ﴿١٧٧ إذ قال لهم شعيب الا تتقون * ١٧٨ إنى لكم رسول أمين * ١٧٩ فاتقوا الله واطيعون * ١٨٠ وما أسألكم عليه من أجر إن أجرى إلا رب العالمين﴾ راڤەی ئەم کۆمەڵە ئایەتەش لەپێشەوە کراوە، بۆیە لێرەدا دووبارەی ناکەمەوە.. جا لە دوای ئەو پەندو ئامۆژگارییانە، پەنجە ئەخاتە سەر کەم و کورتی و ناتەواوییەکانیان و ئەفەرموێ: ﴿١٨١ أوفوا الكيل ولا تكونوا من المخسرين﴾ لە پێوانەدا بەتێرو تەسەلی بۆ خەڵك پێوانە بکەن و لەوکەسانە مەبن کە زەرەرو زیان بەخەڵك ئەگەیەنن و پێوانەیان ناتەواوە ﴿١٨٢ وزنوا بالقسطاس المستقيم﴾ وە کێشانەشتان بە تەرازوویەکی ڕاست و دروست بکەن و مافی خەڵکی بدەن ﴿١٨٣ ولا تبخسوا الناس اشياءهم ولا تعثوا فى الأرض مفسدين﴾ کەل وپەل و شتومەکی خەڵکی مەشکێنن، کەم نرخ و سووك سەیری مەکەن و لێیان کەم مەکەن، وە فەسادو گێرە شێوێنیش مەکەن لەعەرزدا، واتە: بێ باکانە دزیی و تاڵان و بڕۆو زەوت کردن و..هتد مەکەن ﴿١٨٤ واتقوا الذى خلقكم والجبلة الأولين﴾ هەر لەو خوایە بترسن کە ئێوەو کەسانی‌تری پێشووی دروست کرد (الجِبِلَّة و الجِبْلَة و الجُبْلَة و الجُبْل و الجبل والجبل لغات، وهو الجمع ذو العدد الكثير). ﴿١٨٥ قالوا إنما انت من المسحرين﴾ لەوەڵامدا وتیان: بەڕاستیی تۆ (ئەی شوعەیب!) بێ و نەبێ جادووت لێکراوە ﴿١٨٦ وما انت إلا بشر مثلنا﴾ وە تۆش هەر ئادەمیزادێکی لەوە زیاتر نیت ﴿وإن نظنك لمن

الجزء التاسع عشر — سورة الشعراء

وَاتَّقُوا الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالْجِبِلَّةَ الْأَوَّلِينَ ﴿١٨٤﴾ قَالُوا إِنَّمَا أَنتَ
مِنَ الْمُسَحَّرِينَ ﴿١٨٥﴾ وَمَا أَنتَ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا وَإِن نَّظُنُّكَ لَمِنَ
الْكَاذِبِينَ ﴿١٨٦﴾ فَأَسْقِطْ عَلَيْنَا كِسَفًا مِّنَ السَّمَاءِ إِن كُنتَ
مِنَ الصَّادِقِينَ ﴿١٨٧﴾ قَالَ رَبِّي أَعْلَمُ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٨٨﴾ فَكَذَّبُوهُ
فَأَخَذَهُمْ عَذَابُ يَوْمِ الظُّلَّةِ إِنَّهُ كَانَ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٨٩﴾
إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٩٠﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ
الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ ﴿١٩١﴾ وَإِنَّهُ لَتَنزِيلُ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٩٢﴾ نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ
الْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ الْمُنذِرِينَ ﴿١٩٤﴾ بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ
مُّبِينٍ ﴿١٩٥﴾ وَإِنَّهُ لَفِي زُبُرِ الْأَوَّلِينَ ﴿١٩٦﴾ أَوَلَمْ يَكُن لَّهُمْ آيَةً أَن يَعْلَمَهُ
عُلَمَاءُ بَنِي إِسْرَائِيلَ ﴿١٩٧﴾ وَلَوْ نَزَّلْنَاهُ عَلَىٰ بَعْضِ الْأَعْجَمِينَ ﴿١٩٨﴾
فَقَرَأَهُ عَلَيْهِم مَّا كَانُوا بِهِ مُؤْمِنِينَ ﴿١٩٩﴾ كَذَٰلِكَ سَلَكْنَاهُ
فِي قُلُوبِ الْمُجْرِمِينَ ﴿٢٠٠﴾ لَا يُؤْمِنُونَ بِهِ حَتَّىٰ يَرَوُا الْعَذَابَ
الْأَلِيمَ ﴿٢٠١﴾ فَيَأْتِيَهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٢٠٢﴾ فَيَقُولُوا
هَلْ نَحْنُ مُنظَرُونَ ﴿٢٠٣﴾ أَفَبِعَذَابِنَا يَسْتَعْجِلُونَ ﴿٢٠٤﴾ أَفَرَأَيْتَ
إِن مَّتَّعْنَاهُمْ سِنِينَ ﴿٢٠٥﴾ ثُمَّ جَاءَهُم مَّا كَانُوا يُوعَدُونَ ﴿٢٠٦﴾

٣٧٥

الكاذبين﴾ وە هەروا گومانت لێدەکەین هەر لەدرۆزنەکانیت و درۆ ئەکەیت کە ئەڵێیت پەیامبەری خوام ﴿١٨٧ فأسقط
علينا كسفا من السماء إن كنت من الصادقين﴾ دەسا ئەگەر ڕاست ئەکەیت و لە ڕاستگۆیانیت چەند پارچە
(بەرد)ێکمان لەئاسمانەوە بەسەرابباریێنە با لەناومان ببەن!ئەوانە پێیان وابوو هەرگیز شتی وانابێت، بۆیە داوای
ئەوەیان دەکرد: ﴿١٨٨ قال ربي اعلم بما تعملون﴾ شوعەیب ﷺ وتی: پەروەردگارم بە کاروکردارەکانتان زاناترە، جا
ئەگەر شیاوی ئەوەبن، ئەوا بێگومان سزاتان ئەدات، ئەگینا ستەمتان لێ ناکات. ﴿١٨٩ فكذبوه فأخذهم عذاب يوم
الظلة﴾جا سەرەنجام بڕوایان بە(شوعەیب) نەکردو، کردیان بە درۆوە ئینجا لەسەر داوای خۆیان سزای ڕۆژی
هەورەکە گرتنی، ڕاڤەکەرانی قورئان ئەڵێن: خوا تۆڵە سێن لەو ڕۆژەدا گەرمایەکی سەیرو سەمەرەی بۆ ناردن کە (٧)
ڕۆژ لەناویاندا مایەوە، وە لەتاو ئەو گەرمایەدا ماڵ وشوێنەکانی خۆیانیان چۆڵکردو هەڵاتن بۆ دەشت و چۆڵایی
لەپاشا خوا هەورێکی زۆر چڕو پڕی بۆ ناردن و، سێبەری لە سەر کردن، فێنکیان بوویەوەو، یەکتریان بانگ
دەکردو، هەرهەموویان جەم بوون لەژێر هەورەکەدا.. ئینجا خوا ئاگرێکی بۆ ناردن و هەموویانی سووتاند ﴿إنه كان
عذاب يوم عظيم﴾ بەڕاستیی ئەوسزایە، سزای ڕۆژێکی گەورە بوو ﴿١٩٠ إن في ذلك لآية﴾ بەڕاستیی لەو تۆڵەشدا
بەڵگەی زۆر گەورە هەبوو بۆ دەسەڵاتی خوای بەتوانا ﴿وما كان اكثرهم مؤمنين﴾ کەچی لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەی
هۆزەکەت بڕوا ناهێنن ﴿١٩١ وإن ربك لهو العزيز الرحيم﴾ بێگومان پەروەردگاری تۆ زۆر بەتوانا و زاڵە بەسەر هەموو
شتێکدا، میهرەبانیشە، بەرامبەر هەرکەسێك بەڕاستیی ڕووی تێ بکات.

لێرەداهەر (٧) داستانەکە -کە خوا بۆ پەیامبەری ﷺ گێڕانەوە- کۆتاییان دێت,حیکمەتیش لەگێڕانەوەیاندا,
ئەوەبوو کە پێغەمبەر, ئەوەند بێتاقەت و سوور نەبێت لەسەر باوەڕهێنانی هۆزو نەتەوەکەی,چونکە ئەو
پەیامبەرانەیش (علیهم الصلاة والسلام) بەر لەو هاتوون , لەگەڵ ئەو هەموو هەوڵەیاندا, لەگەڵ نەتەوەکەیاندا,هەر
بەگوێیان نەکردن وباوەڕیان نەهێنا، هەتاخوای کارجوان قاری لێگرتن' هەروەك لەسێ سوورەتدا شێوەی
قاڕولەناوبردنەکەی باسکردووە، شیاوی باسە هەر شوێنەی بەپێی گونجاوو شیاوی خۆی، بۆ نموونە: لە
(ئەعراف) دا، بەزەمین لەرزەو (ڕەجفە) گرتنی،پاش ئەوەی ئەوان پێغەمبەرەکەیان هێنایە لەرزەو پێیانگوت:
(لنخرجنك يا شعيب والذين آمنوا معك من قريتنا أو لتعودن في ملتنا). لە (هوود)یشدا ئەوان گاڵتەولاقرتییان ئەکرد:
(أصلاتك تأمرك أن نترك ما يعبد آباؤنا أو أن نفعل في أموالنا مانشاء إنك لأنت الحليم الرشيد) کەوابوو شیاوی
(صەیحە) وشریخەیەك بوون بۆدەمکوتکردنیان، بۆیە (وأخذت الذين ظلموا الصيحة). لێرەشدا عینادیو ئینکاری
زۆریان دەکرد، بۆیە بەوگرەبایە زوو لەناوبران، وەك فەرمویٚ: (فأخذهم عذاب يوم الظلة..).جا دوای باسکردنی
داستانی ئەو پەیامبەرانەو گەلەکانیان، وا بۆ جارێکی دێتەوە سەرباسی قورئان ئەوقورئانەی واباسی ئەو داستانە
ئەکات، وەك دەفەرمویٚ: ﴿١٩٢ وانه لتنزيل رب العالمين﴾ بێگومان ئەو قورئانە نێرراوی پەروەردگاری جیهانەکانە
﴿١٩٣ نزل به الروح الأمين﴾ جوبرەئیلی دەستپاك و ئەمین هێنایە خواریٚ ﴿١٩٤ على قلبك لتكون من المنذرين* ١٩٥
بلسان عربي مبين﴾ بۆ سەردڵیتۆ, تا ببیتە یەکیٚ لەترسێنەران و خەڵکی پیٚ بترسێنی، ئەمەیش بەزمانێکی
عەرەبیی ڕوون و ئاشکرادابەزێنراوە, واتە: بەزمانیقورەیشە, تا هیچ بڕوبیانوویەکیان نەمێنیٚ.

**قورئان لە کتێبەکانی پێشوودا ناوی هەیە:**

﴿١٩٦ وانه لفي زبر الأولين﴾ بەڕاستیی ناوو باسی ئەم قورئانە لەنامەی پەیامبەرانی پێشووشدا هاتووە ﴿١٩٧
أولم يكن لهم آية﴾ ئایا ئەم نیشانە بۆ ئەوان بەس نیە، لەسەر ڕاستیی قورئان ﴿أن يعلمه علماء بني إسرائيل﴾ کە

زانایانی بەنی ئیسرائیل (وەك عەبدوڵڵای کوڕی سەلام و، سەلمان) ئەیزانن و ئاگادارن کە لە (تەورات و ئینجیل)دا باسی قورئان هاتووە. ئەوان لێیان ئەپرسین، ئەمانیش ئەیان وت کاتی هاتنیان هاتووە ﴿[١٩٨] و لو نزلناه على بعض الأعجمين﴾ .خۆئەگەر ئەم قورئانەمان بەوەهەموو ڕەوانبێژییەوە بۆ هەندێ (ئەعەجەمیی) ناردبا، لەباتی ئەوەی کە ئێستا بۆ پێغەمبەرێکی عەرەبی زمانپاراو هاتووە ﴿[١٩٩] فقراه عليهم ماكانوا به مؤمنين﴾ بۆیانیخوێندبایەتەوە، لەعینادیدا هەر بڕوایان پێ نە دەکرد. ﴿[٢٠٠] كذلك سلكناه فى قلوب المجرمين﴾ هەر چۆنێك کە ئەگەر ئەم قورئانە بۆ پیاوێکی ئەعجەمی هاتبا بڕوایان نەدەکردو ئەنجامەکەی هەرئەوە دەبوو, هەرئاوایش خستمانە دڵی تاوانبارانەوە ,هەرچەندە بەزمانی خۆیشیان بێت ﴿[٢٠١] لايؤمنون به﴾ کە لەبەر عینادی خۆیان بڕوای پێ ناهێنن ﴿حتى يروا العذاب الأليم﴾ تا بەچاوی سەر سزا بە ئێشەکە دەبینن ﴿[٢٠٢] فيأتيهم بغتة وهم لا يشعرون﴾ جا کتوپڕیش بێتە لایان و هەستیش نەکەن بەهاتنی ﴿[٢٠٣] فيقولوا هل نحن منظرون﴾ ئەوجا لەپەشیمانیدا: بڵێن: ئاخۆ ئیتر بۆ ماوەیەك مۆڵەتمان پێدەدرێ؟ تا بڕوا بێنین، خۆ ئەیشزانن کەجارێکی تر مۆڵەت و گەڕانەوە نیە، بەڵام چی بکەن لەناچاریدا دەبێ هەر ئەوە بڵێن. (موقاتل) دەڵێ: هاوبەش دانەرەکان بەپێغەمبەریان ﷺ دەوت: ئیتر تاکەی تۆ هەر بەڵێنی سزامان پێ ئەدەیت و نایهێنی..؟! جا ئەم ئایەتە هاتوو فەرمووی: ﴿[٢٠٤] افبعذابنا يستعجلون﴾ ئایا بۆ سزای ئێمە پەلە دەکەن کە زوو بەخەیان بگرێت! ﴿[٢٠٥] افرايت إن متعناهم سنين﴾ ئایا زانیتە ئەگەر چەند ساڵێکیش بیانژێنین باوەڕ دەهێنن؟ ﴿[٢٠٦] ثم جاءهم ماكانوا يوعدون﴾ لەپاشا هەرئەو هەڕەشەو سزایەی بەڵێنیان پێدرا بوو بێتە لایان ﴿[٢٠٧] ماأغنى عنهم ماكانوا يمتعون﴾ ئەو تەمەن درێژیەو خۆشگوزەرانیەیان هیچ کەڵکێکیان پێنابەخشێ جا ئیتر بۆ مۆڵەت بدرێن؟.

الجزء التاسع عشر | سورة الشعراء

مَا أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا يُمَتَّعُونَ ﴿٢٠٧﴾ وَمَا أَهْلَكْنَا مِن قَرْيَةٍ إِلَّا لَهَا مُنذِرُونَ ﴿٢٠٨﴾ ذِكْرَىٰ وَمَا كُنَّا ظَالِمِينَ ﴿٢٠٩﴾ وَمَا تَنَزَّلَتْ بِهِ الشَّيَاطِينُ ﴿٢١٠﴾ وَمَا يَنبَغِي لَهُمْ وَمَا يَسْتَطِيعُونَ ﴿٢١١﴾ إِنَّهُمْ عَنِ السَّمْعِ لَمَعْزُولُونَ ﴿٢١٢﴾ فَلَا تَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ فَتَكُونَ مِنَ الْمُعَذَّبِينَ ﴿٢١٣﴾ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ ﴿٢١٤﴾ وَاخْفِضْ جَنَاحَكَ لِمَنِ اتَّبَعَكَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴿٢١٥﴾ فَإِنْ عَصَوْكَ فَقُلْ إِنِّي بَرِيءٌ مِّمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٢١٦﴾ وَتَوَكَّلْ عَلَى الْعَزِيزِ الرَّحِيمِ ﴿٢١٧﴾ الَّذِي يَرَاكَ حِينَ تَقُومُ ﴿٢١٨﴾ وَتَقَلُّبَكَ فِي السَّاجِدِينَ ﴿٢١٩﴾ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴿٢٢٠﴾ هَلْ أُنَبِّئُكُمْ عَلَىٰ مَن تَنَزَّلُ الشَّيَاطِينُ ﴿٢٢١﴾ تَنَزَّلُ عَلَىٰ كُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ ﴿٢٢٢﴾ يُلْقُونَ السَّمْعَ وَأَكْثَرُهُمْ كَاذِبُونَ ﴿٢٢٣﴾ وَالشُّعَرَاءُ يَتَّبِعُهُمُ الْغَاوُونَ ﴿٢٢٤﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّهُمْ فِي كُلِّ وَادٍ يَهِيمُونَ ﴿٢٢٥﴾ وَأَنَّهُمْ يَقُولُونَ مَا لَا يَفْعَلُونَ ﴿٢٢٦﴾ إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَذَكَرُوا اللَّهَ كَثِيرًا وَانتَصَرُوا مِن بَعْدِ مَا ظُلِمُوا وَسَيَعْلَمُ الَّذِينَ ظَلَمُوا أَيَّ مُنقَلَبٍ يَنقَلِبُونَ ﴿٢٢٧﴾

ترتيبها ٢٧ | سُورَةُ النَّمْلِ | آياتها ٩٣

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

٣٧٦

﴿[٢٠٨] وما اهلكنا من قرية إلا لها منذرون﴾ وە هیچ شارو گوندێکمان لەناو نەبردووە، ئیللا چەند ترسێنەرو ئاگادارکەرەوەیەکمان ناردووە بۆیان ﴿[٢٠٩] ذكرى﴾ تا ئامۆژگاری وەرگرن و داچڵەکێن ﴿وما كنا ظالمين﴾ بێگومان ئێمە ستەمکار نەبووین، چونکە پێش ئەوە موعجیزەو بەڵگەمان پێداون.

## جبریل قورئانی هێناوە:

جا کاتێ خوا دەمکوتی ئەوانەی کرد ئەیانوت: موحەممەد ﷺ نوقڵانە لێدەرەو، پەیامەکەیشی هەرشەیاتینی بۆی دێنێ، فەرمووی: ﴿[٢١٠] وما تنزلت به الشياطين﴾ وە شەیاتینی قورئانیان نەهێناوەتە خوارێ بەڵکو جوبریلی ئەمین هێناویەتی ﴿[٢١١] وما ينبغى لهم وما يستطيعون﴾ ئەوان نەئەوەیان لێدەوەشێتەوەو نە دەیشتوانن قورئانێکیئاوا بێنن ﴿[٢١٢] إنهم عن السمع لمعزولون﴾ چونکە ئەو شەیتانانە هەر لەوکاتەوە پێغەمبەر ﷺ نێردرا،

ئەوان لە گوێگرتن لەفریشتە بەرکەنارکران، وە لە هێنانی‌هەواڵ لە ئاسمانەوەو بڵاو کردنەوەی بەسەر زەوییدا ڕێیان لێگیرا, جا دوای ئەو ڕونکردنەوەیە خوا چوار فەرمان بە پەیامبەر ﷺ دەدا:

یەکەم: ﴿[213] فلا تدع مع الله إلها آخر﴾ جا کەوابوو تۆهیچ کەسێکی تر بانگ مەکەو مەپەرستە لەگەڵ خوادا ﴿فتکون من المعذبین﴾دەنا لەڕیزی سزادراوان دەبیت. ﴿[214] وانذر عشیرتك الأقربین﴾ دووەم: سەرەتا عەشرەت وخێڵکە نزیکەکەت بەسزای خوا بترسێنە، نەوەك وا بزانن کە هەر لەبەرئەوە خزمی تۆن لەسزا ڕزگار ئەبن.. بۆیە ئەویش ﷺ قۆڵی لێهەڵماڵییو، یەکە یەکە بانگی کردن و ناوی بردن و بەسزای خوای گەورە ترساندنی، وەك ئەو فەرموودەیە کە ئیمامی (موسلیم) لە (ئەبی هورەیرە)وە ئەڵێت: (لما نزلت هذه الآیة: (وأنذر عشیرتك الأقربین) دعا رسول الله ﷺ قریشا فاجتمعوا، فعم وخص، فقال: ((یا بنی کعب بن لؤي أنقذوا أنفسکم من النار، یا بنی مرة بن کعب! أنقذوا أنفسکم من النار: یا بنی عبد مناف! أنقذوا أنفسکم من النار، یابني هاشم! أنقذوا أنفسکم من النار، یابنی عبدالمطلب! أنقذوا أنفسکم من النار، یا فاطمة! أنقذی‌نفسك من النار، فإنی لاأملك من الله شیئا، غیر أنی لکم رحما سأبلها ببلالها)) لەم ئایەت و فەرموودەدا وەردەگیردرێ کە خزمایەتی و نزیکی بەپیاو چاکانەوە لەگەڵ لاساریی‌و بێ‌باوەڕییدا هیچ سوودێکی نابێ, هەروەك ئەوەش دەگەیەنن کە بۆ موسڵمان ڕەوایە ئامۆژگاری کافرو خزم و کەس و کاری گومڕا یبکاو پەیوەندیان پێوە بکا. وە لەکتێبەکەی ئیمامی موسلیم دا: ((والذی نفسی بیده لا یسمع بی أحد من هذه الأمة، یهودی ولا نصرانی، ثم لایؤمن بی إلا دخل النار)). هاتووە. واتە: سوێند بەوزاتەی کەگیانی منی بەدەستە، کەسێ نییە لەم ئوممەتەدا، جوولەکەو گاورەکانیش ناوی من ببیسێ‌وبڕوام پێ نەهێنێ ئەگینا ئەڕواتە نێوئاگرەوە.

﴿[215] واخفض جناحك لمن اتبعك من المؤمنین﴾ سێیەم: باڵی میهرەبانی و سۆزت نەوی بکە بۆ ئەو بڕوادارانەی کە پەیڕەوییت لێ ئەکەن. ﴿[216] فإن عصوك فقل إنی برئ مما تعملون﴾ ئینجا ئەگەر- ئەو خوانەناسانە- یاخی بوون و بەگوێیان نەکردیت، پێیان بڵێ: بەڕاستیی لەهەموو کارو کردەوەیەك کە ئێوە ئەنجامی بدەن من بەریی‌وبێزارم , ودڵنیاشبن دەرەنجام دووچاری سزا ئەبن. ﴿[217] وتوکل علی العزیز الرحیم﴾ چوارەم: تەنهاهەر بەخوای زۆر زاڵ و بەدەسەڵات و زۆر میهرەبان پشت ببەستە، چونکە هەرگیز ئەو دەس لە دۆستانی خۆی بەرنادا ﴿[218] الذی یراك حین تقوم﴾ ئەوخوایەی کە تۆدەبینێ کاتێ‌بەئێوارە ئەوەستی بۆ نوێژ بە کۆمەڵ "وەیان بەتەنها لە شەوگاردا ﴿[219] وتقلبك فی الساجدین﴾ هەڵسوکەوتت لەناو ڕیزی سوژدە بەرانادەبینێ , واتە: ئەگەر هەر خۆت بیت، یان لەگەڵ کۆمەڵێکدا بیت، ئەو هەر ئەتبینێ‌و، چاوی لیتەوەیە ﴿[220] إنه هو السمیع العلیم﴾ بەڕاستیی هەر ئەویشە زۆر ژنەوا, هەموو چپەیەك ئەبیستێ, زۆریش بە ئاگاو زانایە، بەهەموو جمو جوڵێکیان.

### شیاتین لای کێ دێن؟:

لەپێشەوە وتیان: قورئان شەیاتین هێناویەتی بۆ موحەممەد ﷺ. جاوا ئێستا ڕەتی ئەداتەوەو ئەفەرموێ: ﴿[221] هل انبئکم علی من تنزل الشیاطین﴾ ئایا پێتان بڵێم شەیتانەکان بۆلای کێ دێن؟ ﴿[222] تنزل علی کل افاك اثیم﴾ ئەوان بۆلای پیاوێکی زۆر درۆزن و بوختانچی و گوناهکاردادەبەزن "وەك خۆتان ئەیانناسن، نەك بۆلای موحەممەد ﷺ کەچەندە ڕاستگۆو دەستپاکە ﴿[223] یلقون السمع واکثرهم کاذبون﴾ گوێ لەفریشتە ڕادەگرن و, پاشان هەرچی ئەبیسن ئەیدەن بەگوێی فاڵچی‌و دۆستەکانی خۆیاندا، بەڵام لەهەمانکاتدا زۆربەشیان درۆزن و بۆخۆشیان شتیکەی تێکەڵدەکەن,کەواتە:ئێوە بڕوایان پێ مەکەن. لە فەرموودەیەکیشدا هاتووە: ((تلك الکلمة من الحق یحفظها

الجنی فیقرقرها –أی یرددها– فی أذن ولیە کقرقرة الدجاج فیخلطون معها أکثر من مأة کذبة)) رواه البخاري. کە خاتوو عائیشە ئەڵێ: خەڵکێك پرسیاری (کاهن، فاڵچی)یان لەپێغەمبەر ﷺ دەکرد، ئەویش فەرمووی: ((إنهم لیسوا بشیء)) بەڕاستیی ئەوانە شتێکی ئەوتۆنین، وتیان: ئاخر گەلێ جار قسەئەکەن و بەڕاستیش دەرئەچێ..! ئەویش فەرمووی: (تلك الکلمة..) ئەوەی کە بەڕاست دەرئەچێ، هەر ئەوەیە کە جنیەکان ئەیفڕێنن و ئەیخەنە گوێی دۆستانی خۆیانەوە، وەك قرە قڕی مریشك، جا دەبینی سەد درۆ تێکەڵ بەو وشە ڕاستەیە ئەکەن و خەڵکی پێ گومڕا ئەکەن. ﴿[٢٢٤] **والشعراء یتبعهم الغاوون**﴾ بێ باوەڕەکان پێیان وابوو کە موحەممەدﷺ شاعیرە، خواش فەرمووی: پێغەمبەر شاعیر نیە،چونکە شاعیران کەسانێکن کە گومڕاکان و لادەرانی ڕێی هەق پەیڕەوییان لێ ئەکەن، ئەوانەی وا لە شەرعی خوا لایانداوە، بەڵام خۆ موحەممەدﷺ کۆمەڵێکی دڵپاك و دەستپاك و داوێن پاك شوێنی کەوتوون.

شیعرو هۆنراوەش هەندێکی ناپەسەندو (مەکروهە)، هەندێکی تری حەرام و یاساغە، بڕێکیشی دروست و ڕەوایە، ئیمامی (موسلیم) لە (عەمر)ەوە دەڵێ: ڕۆژێ لە پاشکۆی پێغەمبەرداﷺ بەسواری وڵاخ ئەڕۆیشتین، فەرمووی: ((هل معك من شعر أمیة بن الصلت بشیء)) لە شیعرەکانی (ئومەییە) شتێکت لەبەرە.؟ وتم: بەڵێ، فەرمووی: ((هیە))! ئەوسا منیش تانزیکەی (١٠٠) سەد بەیتێکم بۆگوت" کەوابوو لە بەرکردنی شیعری چاك وپاك وپڕمانا حیکمەت و گرنگی پێدانیشی شتێکی زۆر باشە. ﴿[٢٢٥] **ألم تر أنهم فی کل واد یهیمون**﴾ئایا نابینی ئەوانە (شاعیران) لەهەموو دۆڵ و شیوێکدا سەرهەڵدەدەن و لەهەموو شتێك دەدوێن ئەمڕۆ مەدح و ستایشی کەسێك ئەکەن، سبەینێ دای ئەپڵۆسن!! دیارە ئەوە بەڵگەی ئەوەیە کە ئەوان شوێنی هەق ناکەون، بۆیە ئاوا ئەمبەرو ئەوبەرئەکەن ﴿[٢٢٦] **وأنهم یقولون مالا یفعلون**﴾ و بەڕاستی ئەوانە شتێ ئەڵێن ، کەچی خۆشیان کاری پێ ناکەن،خەڵکی هەڵئەنێن بۆ بەخشش و فیداکاریی، کەچی خۆیان نایکەن!! ﴿[٢٢٧] **إلا الذین آمنوا وعملوا الصالحات**﴾ ئەوە پیشەی شاعیرە بەد فەڕەکان بوو، بەڵام ئەوانەیان کەبڕوایان هێناوەو کارە چاکەکان ئەنجام دەدەن ﴿**وذکروا الله کثیرا**﴾ و یادیخوا زۆردەکەن باسی یەکتاپەرستی ئەکەن، باسی پایەی پەیامبەرێتیو بانگەوازەکەی ئەو ئەکەن ﴿**وانتصروا من بعدما ظلموا**﴾ وە بەوتواناییەی هەیانە پشتیوانی لەبڕواداران دەکەن و، کاتێکیش ستەمیان لێبکرێت تۆڵە دەسێنن، سەیری (عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە)و(حەسسان)و(کەعبی کوڕی مالیك)و(کەعبی کوڕی زوهەیر)بکە چۆن موشریکەکان دائەکوتن ،کاتێ ڕێ لەئیسلام و موسڵمانان دەگرن، وەلەسوورەتی (٤٢/٤١-٤٢) وە(١٢٦/١٦) داهەر ئەو مەبەستە هاتووە. ﴿**وسیعلم الذین ظلموا**﴾ وەئەوانەی واستەمیان کردووەو پشتیان لە ئیسلام کردووە بەم زوانە ئەزانن ﴿**أی منقلب ینقلبون**﴾ کە بۆ چ جێگایەك دەگەڕێنەوە. بەڵێ.. شیعرو هۆنراوە بەشە چاکەکەی چاکەو، خراپەکەشی خراپە، واتە: ئەوەی بەیانی ڕاستیو ئەخلاق و قییەم ئەکات، دیارە ئەوە چاکەو لەئیسلامدا پەسەندە، ئەوەیشی شتی حەرام و یاساغ لەپێش چاوی مرۆڤدا جوان دەکات، حەرام و یاساغە. بۆیە بەوشێوەیەش قورئان باسی ئەکات، چونکە گەلێ جار لەلایەن شاعیرانەوە باوی مرۆڤی ترسنۆك ئەدرێ بەسەر مرۆڤی ئازاو بلیمەتدا! وە ناڕەوا دەکرێ بە ڕەوا! بۆیە پەیامبەری خۆشەویستمان ﷺ ئەفەرموێ: ((لأن یمتلئ جوف رجل قیحا ودما یریە (أي: یأکلە ویفسدە، وأصاب رئتە بالإفساد، خیرلە من أن یمتلئ شعرا)) متفق علیە(فتح الباری: ٥٤٨/١٠، مسلم: ١٧٧٠/٤).واتە: ئەگەرپیاوێ گەدەو ڕیخۆڵەی خۆی پڕبکا لە کێماووخوێناوی دوژەهییان،

تاڕیخۆڵەکانی خراپ دەبن، زۆرلەوە بۆی باشترە کەدڵ و دەروونی خۆی پڕبکا لەشیعر! حەسسان کاتێ دیفاع و بەرگری لەپەیامبەر ﷺ دەکات بە ئەبوسوفیان ئەڵێ:

هَجَوْتَ محمدا فأجبتُ عنهُ — وعندالله فی ذاك الجزاءُ

وإن أبی ووالدتی وعِرْضِی — لعرضِ محمد منکم وِقاءُ

اتشتمه ولَستَ له بِکُفْؤ — فَشرُکُما لِخیرکُما الفداءُ

لسانی صارمٌ لا عیبَ فیهِ — وبحری لا تکدره الدِّلاءُ

له(١٤١٦/١١/١٦/١٥) ك بەرامبەر بە(١٩٩٦/٤/١٥/١٤)ز لەم سوورەتە بوومەوە لەهەڵەبجە له ڕاگەیاندنی بزووتنەوەی ئیسلامیی.

*** *** ***

## ٢٧- سوورەتی (نەمل)ـە

## مەککەییەو (٩٣) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتە لە پاش سوورەتی (شوعەرا)وەهاتۆتە خوارەوە، ئەمیش هەروەك سوورەتە مەککەییەکانیتر باسی بیروباوەرو عەقیدەو یەکتاپەرستیی و، پەیامەکەی پەیامبەرو، زیندوو بوونەوە ئەکات، یەکێکە لەو سێ‌سوورەتانەی بەدوای یەکدا هاتوونەتە خوارەوە، هەر وەك لە قورئانیشدا لەدوای یەك دانراون: (شوعەراء، نەمل، قەصەص). ئەم سوورەتە باسی گەورەیی قورئان ئەکات کەچەند مۆجیزەیەکی زۆر مەزن و گەورەیە!! پاشان داستانی پەیامبەرەکان، هەندێکیان بە کورتیی و، هەندێکیشیان بەدرێژیی، بە تایبەت (سولەیمان) پێغەمبەر ﷺ کە چۆن ئەو هەموودەسەڵات و داراییە هەیبوو بەختیکرد بۆ بانگەوازەکەی خوا، قسەی لەگەڵ گەڵ لەحاکم و دەسەڵاتدارەکانی چەرخی‌سەردەمی خۆیکرد و، بانگی کردن بۆ لای خوا، (بەلقیس)یش یەکێك بوو لەوانە.

### قورئان ڕێنماو ترسێنەرە:

﴿بسم الله الرحمن الرحیم* ١ طس﴾ ئەم جۆرە پیتانە لە چەند جێگایەکی تردا تەفسیر کراون ﴿تلك آیات القرآن وکتاب مبین﴾ ئەم ئایەتانە دەیاننێرینە لای تۆ ئەی موحەممەد! ﷺ ئایەتی قورئان وکتێب ونامەیەکی زۆرئاشکراو روونەلای ئەوانەی کە بەوردیی بیری لێبکەنەوە ﴿٢ هدی وبشری للمؤمنین﴾ ڕێنمایی و، مژدەیە بۆ باوەڕداران، بەرەو ڕاستیی زیاتردەستیان ئەگرێ ﴿٣ الذین یقیمون الصلاة ویؤتون الزکاة﴾ ئەوانەی وا بە تێرو تەسەل نوێژەکانیان دەکەن و، لەماڵ وسامانیان زەکات ئەدەن ﴿وهم بالآخرة هم یوقنون﴾ ولەهەمانکاتیشدا یەقینییان بە رۆژی دواییش هەیە.

ئینجا دێتە سەرباسی ئەوانەی بڕوایان بە دوارۆژ نیە و، هاتنیشی‌بەدوور دەزانن، وەك دەفەرموێ:﴿إن الذین لا یؤمنون بالآخرة﴾ بێ‌شك ئەو کەسانەی باوەڕیان بەقیامەت نیە ﴿زینا لهم اعمالهم﴾ کردەوەکانیانمان بۆ شیرین کردوون بە دروستکردنی‌ئارەزوو تێیاندا. ئەزانن هەرئەو کارەی ئەوان چاکە، واتە: چونکە خۆیان بۆخۆیان حەزیان لە فەسادو گێرەشێوێنییە، ئێمەیش ئەوەمان لاخۆشەویستکردن و،ئازادو سەربەستیشمانکردن بۆ هەڵبژاردنی هەر ڕێگەیەك دەیانەوێ ﴿فهم یعمهون﴾ لە گومڕاییاندا ویڵن، چاك و خراپ لە یەك ناکەنەوە، بۆیە ئاوا ڕێبازی گومڕاییان گرتووەو تێیدا دەسووڕێنەوە ﴿٥ أولئك الذین لهم سوء العذاب﴾ ئا ئەوانە کەسانێکن هەر لەدنیادا ناسۆرترین

سزایان بۆ هەیە، بە کوژران و دیلکردن، هەروەك لە (بەدر)دا بینران ﴿وهم فی الآخرة هم الأخسرون﴾ لە دوارۆژیشدا ئەوانن لە هەمووکەسێك زیانمەندترن، واتە: کەسێ تر وەك ئەوان تووشی زیانی ئاوا نابێ. دوای باسکردنی گەورەیی و پلەی قورئان، ئینجا باسی گەورەیی پەیامبەر ﷺ دەکات، بۆیە ئەفەرموێ: ﴿[٦] وإنك لتلقى القرآن من لدن حکیم علیم﴾ بێگومان تۆ ئەی موحەممەد! ﷺ هەر لەلایەن خوایەکی کار بەجێ و داناو زاناوە ئەم قورئانەت پێدەگا.

## مووساو فیرعەون و دوا رۆژیی:

لەم چەن ئایەتەدا خوا سەر گروشتەی (مووسا) بۆ پێغەمبەر دەگێڕێتەوە، هەتا چاوی لێبکاو ئەمیش وەکو ئەو نەفەس درێژبێ و، کۆڵ نەدا لەکارەکەیدا، بۆیە دەفەرموێ: ﴿[٧] إذ قال موسى لأهله إنی آنست نارا﴾ یادیان بێنە کە: مووسا لە گەڕانەوەیدا بۆ (میسر) بەخێزان وهاوسەرەکەی خۆی گوت: بەراستیی من ئاگر (نوور)ێکم لە دوورەوە چاوکرد. (تەبەریی) دەڵێت: ئەم بەسەر هاتە ئەوکاتەبوو کەلە(مەدیەن)ـەوە گەڕایەوە بۆ میسر، جالەوسەفەرەیدا ڕێگەیان گومکردو شەویان بەسەرهات، زۆرشەوەکەشی تاریك و سارد بوو، خێزانەکەیشی خەریك بوو منداڵی دەبوو. ﴿سآتیکم منها بخبر﴾ دەڕۆم بە زوویی هەواڵێکتان بۆدێنم ﴿وآتیکم منها بشهاب قبس﴾ یان چڵۆسکێکی ئاگرتان بۆدێنم ﴿لعلکم تصطلون﴾ بەشکوم خۆتانی پێگەرم بکەنەوە ﴿[٨] فلما جاءها﴾ جا کە نزیکی ئاگرەکە بوویەوەو هاتەلای، ڕووداوێکی سەیروسەمەرەی دیبیت: دییتی لەناو درەختێکی تەڕدا شۆڵەو نوورێك دەدرەوشێتەوە! ﴿نودی أن بورك من فی النار ومن حولها﴾ و لە(غەیب)ـەوە بانگ کراو پێیگوترا: کە پیرۆز کرا ئەوەی لەلای ئەو ئاگرەدایەو لەدەورووبەری ئەودایە، واتە: مووساو فریشتەکان، گوتراوە: ئاگر نەبووە هەر نوور بووە، ئەم فەرموودەیەش پتر ئەو ماناو مەبەستە ڕۆشن دەکاتەوە کەدەفەرموێ: ((إن الله لاینامُ، ولا ینبغیله أن ینامَ، یَخْفِضُ القِسْطَ ویَرْفعُهُ، یُرْفَعُ إلیه عمَلُ اللیل قَبْلَ النهار، وعملُ النهار قبلَ اللیل)) (مەسعوودی) دەڵێ: (حجابُهُ النورُ ولو کَشَفَهُ لَأَحْرَقَتْ سُبُحاتُ وَجْهِهِ کلَّ شئٍ ادرکَهُ بَصَرُهُ). پاشان (ئەبووعوبەیدە) ئەم ئایەتەی: (أن بورك من فی النار ومن حولها) خوێندەوە. (ئیبن ابیحاتم). وأصل الحدیث فی صحیح مسلم. (تەفسیری ئیبن کەسیر). واتە: هەرگیز دەست نادا خوای گەورە بخەوێ، خوا هەندێ جار تەرازووی دادی خۆی بەرەو خوار نەوی دەکا (بەرزق و ڕۆزی بۆ زەویی) هەندێ جاریش هەڵی دەبڕێ بەرەولای خۆی (بە بەرزکردنەوەی کردەوەی مرۆیەکان) وە کاروکردەوەی شەو، پێش کاروکردەوەی ڕۆژ بڵند دەکرێ و سەر دەخرێ، هی ڕۆژیش پێشکردەوەی شەو، وەتەنیا پەردەو لەمپەرێك هەبێ بۆدیتنی خوا، هەر ئەوەیەکە ئەگەر ئەوپەردەیە لابدرێ بۆ بینینی خوا، ئەوا نووری روخساری خوای گەورە دەیسووتێنێ/ شەرحی موسلیم. ﴿وسبحان الله رب العالمین﴾ زۆر

سُورَةُ النَّمۡلِ — الجزء التاسع عشر

الحزب ٣٨

بسم الله الرحمن الرحيم

طسٓۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡقُرۡءَانِ وَكِتَابٖ مُّبِينٍ ١ هُدٗى وَبُشۡرَىٰ
لِلۡمُؤۡمِنِينَ ٢ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم
بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ يُوقِنُونَ ٣ إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ زَيَّنَّا لَهُمۡ
أَعۡمَٰلَهُمۡ فَهُمۡ يَعۡمَهُونَ ٤ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَهُمۡ سُوٓءُ ٱلۡعَذَابِ
وَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ هُمُ ٱلۡأَخۡسَرُونَ ٥ وَإِنَّكَ لَتُلَقَّى ٱلۡقُرۡءَانَ مِن
لَّدُنۡ حَكِيمٍ عَلِيمٍ ٦ إِذۡ قَالَ مُوسَىٰ لِأَهۡلِهِۦٓ إِنِّيٓ ءَانَسۡتُ نَارٗا سَـَٔاتِيكُم
مِّنۡهَا بِخَبَرٍ أَوۡ ءَاتِيكُم بِشِهَابٖ قَبَسٖ لَّعَلَّكُمۡ تَصۡطَلُونَ ٧ فَلَمَّا
جَآءَهَا نُودِيَ أَنۢ بُورِكَ مَن فِي ٱلنَّارِ وَمَنۡ حَوۡلَهَا وَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ
ٱلۡعَٰلَمِينَ ٨ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّهُۥٓ أَنَا ٱللَّهُ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ٩ وَأَلۡقِ عَصَاكَۚ
فَلَمَّا رَءَاهَا تَهۡتَزُّ كَأَنَّهَا جَآنّٞ وَلَّىٰ مُدۡبِرٗا وَلَمۡ يُعَقِّبۡۚ يَٰمُوسَىٰ لَا تَخَفۡ
إِنِّي لَا يَخَافُ لَدَيَّ ٱلۡمُرۡسَلُونَ ١٠ إِلَّا مَن ظَلَمَ ثُمَّ بَدَّلَ حُسۡنَۢا بَعۡدَ
سُوٓءٖ فَإِنِّي غَفُورٞ رَّحِيمٞ ١١ وَأَدۡخِلۡ يَدَكَ فِي جَيۡبِكَ تَخۡرُجۡ بَيۡضَآءَ
مِنۡ غَيۡرِ سُوٓءٖۖ فِي تِسۡعِ ءَايَٰتٍ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَقَوۡمِهِۦٓۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمٗا فَٰسِقِينَ
١٢ فَلَمَّا جَآءَتۡهُمۡ ءَايَٰتُنَا مُبۡصِرَةٗ قَالُواْ هَٰذَا سِحۡرٞ مُّبِينٞ ١٣

٣٧٧

بەرزو پاکە ئەوخوایە کە پەروەردگاری جیهانەکانە ﴿٩ یا موسى إنه أنا الله العزیز الحکیم﴾ ئەی مووسا! بەڕاستیی
(ئەوەی قسەت لەگەڵ دەکا) ئەمنم، خوای بەدەسەڵات ودانـاو کـارجوان، هـەموو کـارێکم بەحیکمەت و بەرنامەیە
﴿١٠ والق عصاك﴾ وە دار دەستەکەت هەڵدە، هەتا بەچاوی خۆت ببینی چی ڕوودەدا و، بشزانی دەسەڵات و توانای
ئێمەش چەندە؟ ﴿فلما رآها تهتز کأنها جان﴾ جا کە (دار دەستەکەی) هاویشت و دیتی، وا زۆر بەپەلە وەکو تیرە
مارێك دەخزێ و دەجوڵێتەوە. (ئیبن کەسیر) ئەڵێ: (والجان: ضرب من الحیات، أسرعه حرکة وأکثره إضطرابا) لە
فەرموودەیەکی (متفق علیه)دا هاتووە: ((نَهى عن قَتْلِ جِنانِ البیوت)) واتە: ڕێ لەکوشتنی مارە چکۆلەکانی ناو ماڵ
گیراوە ﴿ولى مدبرا ولم یعقب﴾ مووسا بەپەلە هەڵات و، لای نەکردەوە ﴿یا موسى لا تخف﴾ بۆیە لەلایەن خواوە
بـانگی لێکـرا: ئـەی مووسـا! مەترسـە، وەرە بـۆلای خـۆم،
لەپـەنای منـدا بـە ﴿إنی لا یخاف لدی المرسلون﴾ چـونکە
بەڕاسـتیی پەیامبـەران لای مـن نـابێ بترسـن و دووچـاری
ئەزیەت ببن، واتە: ترست نەبێ، چونکە تۆ پێغەمبەری منی
﴿١١ إلا من ظلم ثم بدل حسنا بعد سوء﴾ وە کەسێ کە لەنێو
مەردمدا ستەم بکا، دیارە ئـەوە دەبێ لـەخۆی بترسـێ، من
دووچـاری سـزایان بکـەم، مەگـەر ئـەوەی سـتەمی کردبـێ
پەشیمان بێتـەوەو خراپەکـەی بەچاکە گۆڕیبێتـەوە ﴿فإنی
غفور رحیم﴾ ئـەوە بەڕاسـتیی مـن بـۆ ئـەو جـۆرە کەسـانە
خوایـەکی زۆر لێبـوردەی میهرەبـانم، (ئـیبن کەسـیر) دەڵـێ:
(هذا إستثناء منقطع).(روح المعانی)یش دەڵێ: (الإستثناء
فیـه منقطـع عنـد کـثیر، إلا أنـه روی عـن الفـراء والزجـاج
وغیرهما: أن المراد بمن ظلم من أذنب عن غیر الأنبیاء ﷺ و
المعنى علیه: لکن من ظلم من سائر العباد ثم تاب فإنی أغفر
له. وقال جماعة: إن المراد به من فرطت منه صغیرة ماوجد
فیه خلاف الأولى بالنسبة إلى من شأنه من المرسلین ﷺ).
﴿١٢ وادخل یدك فی جیبك تخرج بیضاء من غیر سوء﴾ وە
دەستیشت بخـە باخەڵتـەوەو، پاشـان دەریخـەوە دەبینـی وەکـو چـۆڕی شیر سـپی پـاك و بێعـەیب دێتـە دەرێ و،
ڕووناکی دەداتەوە ﴿فی تسع آیات إلى فرعون و قومه﴾ ئەو دوو موعجیزەو بەڵگانە "دەست و، داردەستەکەت" دوو
ئایەتن لەو نۆئایەتانەی پێت دەبەخشین و ئەبنە بەڵگەت، کاتێ دەچیت بۆلای فیرعەون وگەلەکەی ﴿إنهم کانوا قوما
فاسقین﴾ چونکە بەڕاستیی ئەوانە گەلێکی یاخیی لەسنوور دەرچوون ﴿١٣ فلما جاءتهم آیاتنا مبصرة﴾ ئینجا
کاتێکیش بەڵگە ئاشکراو ڕۆشنەکەرەوەکانی ئێمەیان بۆهات ﴿قالوا هذا سحر مبین * ١٤ وجحدوا بها﴾ وتیان: ببێ
و نەبێ ئەمەهەر جادوویەکی ئاشکرایەو نکوڵییان کردن ﴿واستیقنتها انفسهم﴾ وە لەناخی دەروونیاندا متمانەو
یەقینیان هەبوو بەڕاستیان ﴿ظلما وعلوا﴾ نکوڵییان کردن لەڕووی ستەمکاریی و خۆ بەزل زانینەوە نەك لەڕووی
هەق و ڕاستیەوە ﴿فانظر کیف کان عاقبة المفسدین﴾ جا تۆیش سەیر بکە پاشەڕۆژی خراپکارەکان چۆن بوو،

الجزء التاسع عشر — سورة النمل

وَجَحَدُوا۟ بِهَا وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا ۚ فَٱنظُرْ كَيْفَ
كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿١٤﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ وَسُلَيْمَـٰنَ عِلْمًا ۖ
وَقَالَا ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى فَضَّلَنَا عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّنْ عِبَادِهِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٥﴾
وَوَرِثَ سُلَيْمَـٰنُ دَاوُۥدَ ۖ وَقَالَ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ عُلِّمْنَا مَنطِقَ ٱلطَّيْرِ
وَأُوتِينَا مِن كُلِّ شَىْءٍ ۖ إِنَّ هَـٰذَا لَهُوَ ٱلْفَضْلُ ٱلْمُبِينُ ﴿١٦﴾ وَحُشِرَ
لِسُلَيْمَـٰنَ جُنُودُهُۥ مِنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ وَٱلطَّيْرِ فَهُمْ يُوزَعُونَ ﴿١٧﴾
حَتَّىٰٓ إِذَآ أَتَوْا۟ عَلَىٰ وَادِ ٱلنَّمْلِ قَالَتْ نَمْلَةٌ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّمْلُ ٱدْخُلُوا۟
مَسَـٰكِنَكُمْ لَا يَحْطِمَنَّكُمْ سُلَيْمَـٰنُ وَجُنُودُهُۥ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ
﴿١٨﴾ فَتَبَسَّمَ ضَاحِكًا مِّن قَوْلِهَا وَقَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِىٓ أَنْ أَشْكُرَ
نِعْمَتَكَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتَ عَلَىَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَىَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَـٰلِحًا
تَرْضَىٰهُ وَأَدْخِلْنِى بِرَحْمَتِكَ فِى عِبَادِكَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿١٩﴾
وَتَفَقَّدَ ٱلطَّيْرَ فَقَالَ مَا لِىَ لَآ أَرَى ٱلْهُدْهُدَ أَمْ كَانَ مِنَ
ٱلْغَآئِبِينَ ﴿٢٠﴾ لَأُعَذِّبَنَّهُۥ عَذَابًا شَدِيدًا أَوْ لَأَا۟ذْبَحَنَّهُۥٓ
أَوْ لَيَأْتِيَنِّى بِسُلْطَـٰنٍ مُّبِينٍ ﴿٢١﴾ فَمَكَثَ غَيْرَ بَعِيدٍ فَقَالَ
أَحَطتُ بِمَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ وَجِئْتُكَ مِن سَبَإٍۭ بِنَبَإٍ يَقِينٍ ﴿٢٢﴾

٣٧٨ — إني وجدت

دیارە، پاشەرۆژیان هەر ئەوە بوو کەفیرعەون و قەوم و گەلەکەی خنکێنران. کەوابوو ئەی نکوڵی کاران بە پێغەمبەر ﷺ ئەە ئێوەش وشیارو ئاگادار بن! ئەگینە ئەوەی دووچاری ئەوان بوو، دووچاری ئێوەیش ئەبێ.

جا دێتە سەر چیرۆکی دووەم: داستانی (داود) و (سولەیمان) سڵاوی خوایان لێ بێت: ﴿[١٥] ولقد آتینا داود وسلیمان علما﴾ ئێمەیش بووین زانست و زانیارییەکی فراوانمان بە داوودو سولەیمان بەخشیی ﴿وقالا الحمدلله الذی فضلنا علی کثیر من عباده المؤمنین﴾ جا هەردووکیان لەبەرامبەر ئەو بەخششەوە وتیان: سوپاس و ستایش هەر بۆخوایێ کە میهرەبانی لەگەڵ کردین و رێزی ئێمەی دا بەسەر زۆرێك لە بەندە بڕوادارەکانی خۆیدا، لەوانە کە وەك ئێمە میهرەبانی لەگەڵ نەکردوون ﴿[١٦] وورث سلیمان داود﴾ سولەیمان – لەناوکوڕەکانی تری داوددا– بووبە جێنشینی داوودی باوکی، پەیامبەرێتی و دەسەڵاتی بەدەست گرت، ئەوسا (با)کان و جنییەکانی بۆ رام کرا. (ئیبن کەسیر) ئەڵێ: مەبەست بەو میراتە، میراتی دەسەڵات و پێغەمبەرایەتییە، نەك میراتی ماڵ و سامان، چونکە پێغەمبەران میراتی ماڵیان لێ نەبراوە، وەك پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ((نحن معاشر الأنبیاء لا نورث، ما ترکناه فهو صدقة)) متفق علیه. واتە: ئێمەی کۆمەڵی پێغەمبەران میراتمان لێ نابرێ، بەڵکوهەرشتێکمان پاش خۆمان بەجێ هێشت، دەبێتەخێروسەدەقە بۆ (بیت المال)ی گشتیی. ﴿وقال یا أیها الناس علمنا منطق الطیر﴾ سولەیمان لەڕووی ددان نان بە نیعمەتەکانی خوا وتی: خەڵکینە! ئێمە فێری زمان ودەنگ وئاوازی باڵندە کراویین تێگەیەنراوین و ئەزانین چی ئەڵێن. بەڵێ.. زۆرێکی زۆرینە لەم چەرخەدا هەوڵیان داوە بۆ تێگەیشتن لەسەداو ئاوازی پەلەوەرەکان، ئەوەتا زۆربەیان خەریکە لێیان تێدەگەن. هاوارو دەنگی برسیەتیی، تینوویەتیی، سەرما، گەرما، دوژمن بێتە سەری.. هتد. لەو سەردەمەیشدا خوا سولەیمانی فێری زمانی پەلەوەر کرد، وەك بفەرموێ: ئێستا ئێوە هیچی لێ نازانن، بەڵام رۆژێك دێت خەڵکی لێیان تێدەگاو ئەیزانن. ﴿واوتینا من کل شئ﴾ لەهەموو شتێك –لەوانەی پێویستمان پێیان هەیە– بەشێکمان پێدراوە بۆ بەڕێوەبردنی حکوومەت و دەسەڵاتەکەمان ﴿إن هذا لهو الفضل المبین﴾ بەڕاستیی ئەمە فەزڵ و بەهرەیەکی روون و ئاشکرایە، کە خوا لەگەڵ ئێمەی کردووە ﴿[١٧] وحشر لسلیمان جنوده من الجن والإنس والطیر﴾ یەکێ لەو بەهرانەش ئەمەیە کە: هەرچی سەربازولەشکری سولەیمان هەبوو، دەستە دەستە تێکەڵاو لەجنیی و، لە ئادەمیی و، باڵندە، بۆئەوەی دەسەڵاتی پاشایەتی دەرکەوێ لەشرێنێکدا کۆکرانەوە، بەڵێ پێویستە دەسەڵاتداری موسڵمان هێزو وزەی ببێ، بەتایبەت لەم چەرخەدا ﴿فهم یوزعون﴾ جا ئەوان دەستە دەستە نمایش کران و رێك و پێك ڕاگیران ودەڕۆیشتن وەك یاسای سوپا، سەرەتاو کۆتایی بۆ دیاریی کرا، تا لەڕۆیشتندا زۆر بەرێك و پێك بچن و پێشی یەك نەکەون.

## سولە یمان و بوهلی مێروولان:

لەم ئایەتانەشدا یەکێ تر لەو بەهرانە بە سولەیمان درابوو – تێگەیشتن لە وتوێژی مێرووله– دەخاتە روو: ﴿[١٨] حتی إذا أتوا علی واد النمل﴾ تا گەیشتنە دۆڵی مێروولان لەشامدا وەك قەتادە دەڵێ. ﴿قالت نملة یا أیهاالنمل ادخلوا مساکنکم﴾ مێرووله‌یەکی مێچکە هاواری کردو وتی: ئەی مێروولەکان! بچنەوە ناوماڵ و کون و جێگاکانتانەوە ﴿لا یحطمنکم سلیمان وجنوده وهم لا یشعرون﴾ با سولەیمان وسوپاکەی بێ ئاگایانە پێشێلتان نەکەن، واتە: ئەگەر پێتان بزانن لەشکرێکی بەبەزەیین و شتی وا ناکەن ﴿[١٩] فتبسم ضاحکا من قولها﴾ ئینجا سولەیمان لە بیستنی وتەی مێروولەکە (نەوەك پێتان نەزانن) کەیف خۆش بوو و زەردەخەنەیەکی کردو پێکەنی واتە: لەشکرێکی بەسۆزو میهرەبانن، خۆنەگەر بزانن پێ بەمێروو لەشدا نانێن ﴿وقال رب أوزعنی ان أشکر نعمتك

التی أنعمت علی وعلی والدی﴾ سولەیمان وتی: ئەی پەروەردگاری من! وا ڕامم بێنە تابتوانم هەمووکات سوپاسی ئەو نیعمەتانەت بکەم کە ڕشتووتن بەسەر من ودایك و باوکمدا ﴿وان اعمل صالحا ترضاه﴾ وکۆمەکیم بکە تاهەمیشە کارێکی چاك وباشی وائەنجام بدەم، تۆ پێی ڕازیی وخۆشنوودبیت ﴿وادخلنی برحمتك فی عبادك الصالحین﴾ و بە لوتف و میهرەبانی خۆشت بمخەرە ڕیزی بەندە چاك کارەکانتەوە. بەڵێ.. هەرکەسێك کەمێك لەژیان و سیاسەتی مێرووله بکۆڵێتەوە، زیاتر ملکەچی بڕیارو فەرمانەکانیخوا ئەبێت، بۆ یەش لێرەدا بەو شێوەیە باسی مێرووله ئەکات، کە بزانرێ مێروولەش - وەکو ئادەمیزاد - خاوەنی عەقڵ و تەگبیرو ڕاوێژو سیاسەتێکی تایبەتی خۆیەتی، دەفامن خۆیان لەتیاچوون و بەژێرپێ بوونەوە لابدەن.

الجزء التاسع عشر — سورة النمل

إِنِّي وَجَدتُّ ٱمۡرَأَةٗ تَمۡلِكُهُمۡ وَأُوتِيَتۡ مِن كُلِّ شَيۡءٖ وَلَهَا
عَرۡشٌ عَظِيمٞ ﴿٢٣﴾ وَجَدتُّهَا وَقَوۡمَهَا يَسۡجُدُونَ لِلشَّمۡسِ مِن
دُونِ ٱللَّهِ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَعۡمَٰلَهُمۡ فَصَدَّهُمۡ عَنِ ٱلسَّبِيلِ
فَهُمۡ لَا يَهۡتَدُونَ ﴿٢٤﴾ أَلَّا يَسۡجُدُواْۤ لِلَّهِ ٱلَّذِي يُخۡرِجُ ٱلۡخَبۡءَ
فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَيَعۡلَمُ مَا تُخۡفُونَ وَمَا تُعۡلِنُونَ ﴿٢٥﴾ ٱللَّهُ
لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡعَظِيمِ۩ ﴿٢٦﴾ ۞ قَالَ سَنَنظُرُ
أَصَدَقۡتَ أَمۡ كُنتَ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٢٧﴾ ٱذۡهَب بِّكِتَٰبِي هَٰذَا
فَأَلۡقِهۡ إِلَيۡهِمۡ ثُمَّ تَوَلَّ عَنۡهُمۡ فَٱنظُرۡ مَاذَا يَرۡجِعُونَ ﴿٢٨﴾ قَالَتۡ يَٰٓأَيُّهَا
ٱلۡمَلَؤُاْ إِنِّيٓ أُلۡقِيَ إِلَيَّ كِتَٰبٞ كَرِيمٌ ﴿٢٩﴾ إِنَّهُۥ مِن سُلَيۡمَٰنَ وَإِنَّهُۥ
بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٣٠﴾ أَلَّا تَعۡلُواْ عَلَيَّ وَأۡتُونِي مُسۡلِمِينَ ﴿٣١﴾
قَالَتۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَؤُاْ أَفۡتُونِي فِيٓ أَمۡرِي مَا كُنتُ قَاطِعَةً أَمۡرًا حَتَّىٰ
تَشۡهَدُونِ ﴿٣٢﴾ قَالُواْ نَحۡنُ أُوْلُواْ قُوَّةٖ وَأُوْلُواْ بَأۡسٖ شَدِيدٖ وَٱلۡأَمۡرُ إِلَيۡكِ
فَٱنظُرِي مَاذَا تَأۡمُرِينَ ﴿٣٣﴾ قَالَتۡ إِنَّ ٱلۡمُلُوكَ إِذَا دَخَلُواْ قَرۡيَةً
أَفۡسَدُوهَا وَجَعَلُوٓاْ أَعِزَّةَ أَهۡلِهَآ أَذِلَّةٗۚ وَكَذَٰلِكَ يَفۡعَلُونَ ﴿٣٤﴾
وَإِنِّي مُرۡسِلَةٌ إِلَيۡهِم بِهَدِيَّةٖ فَنَاظِرَةُۢ بِمَ يَرۡجِعُ ٱلۡمُرۡسَلُونَ ﴿٣٥﴾

٣٧٩

**سولەیمان لە پەپوو سێمانە دەگەڕێ:**

پاشای زیرەك ودڵسۆز هەمیشە لە حاڵی لەشکرەکەی دەپێچێتەوەو دەپرسێت: ﴿[٢٠] وتفقد الطیر﴾ سولەیمان عليه السلام وەك باوی پاشاکان کەوتە پەیجووری باڵندە وە ﴿فقال ما لی لا أری الهدهد﴾ وتی: چیمە پەپووسێمانە نابینم؟ ﴿ام كان من الغائبین﴾ یان لێرە نیەو لەنادیارانە؟ ﴿[٢١] لأعذبنه عذابا شدیدا﴾ سولەیمان هەڕەشەی لێدەکات و ئەڵێت: مەرج بێ لەسەر ئەمە سزایەکی زۆر توندی بدەم ﴿او لأذبحنه﴾ یا سەری بڕم بۆئەوەی ئەوانیتر پەندی لێ وەربگرن ﴿اولیأتینی بسلطان مبین﴾ یان بەڵگەیەکی ڕونم بۆ دێنێ, بابزانم هۆی نادیاریەکەی چیە؟.

**پەپوو سێمانەو دەنگ و باسەکەی (سەبا):**

پەپوو سێمانە چەندەی پێدەچێت,پاشان دەگەڕێتەوە,وەکو دەفەرموێ: ﴿[٢٢] فمكث غیر بعید فقال احطت بما لم تحط به﴾ زۆری نەخایاند هاتەوەو وتی: من ئاگاداری شتێك بووم کە تۆ تا ئێستا ئاگات لێ نەبووە و پێت نەزانیوە ﴿وجئتك من سبإ بنبإ یقین﴾ وە من لەشاری (سەبا)ی‌یەمەنەوە هاتووم بۆلات بە هەواڵێکیەواوە هیچ شکت لە ڕاستی نەبێ!! ﴿[٢٣] إنی وجدت امراة تملكهم﴾ هەواڵەکەیش ئەمەیە لەوگەشتەمدا, ئافرەتێکم دیت لەوێ پاشایەتی دەکردن, وەك (قورتوبی)دەڵێ بەناوی بەلقیس فەرمان ڕەوایی و سەرداریی‌مەملەکەتەکەی دەکردن، ئەوانیش ملکەچی بوون ﴿واوتیت من كل شئ﴾ وە لەهەمووشتێکی پێدراوە: سامان و دارایی و لەشکروسوپاو هێزودەسەڵاتی زۆر ﴿ولها عرش عظیم﴾ تەختێکیپاشایەتی گەورەشی هەیەو ڕازێنراوەتەوە بەزێڕو گەوهەرو مرواریی و، لە کۆشکێکی سەرسوڕهێنەردایە ﴿[٢٤] وجدتها وقومها یسجدون للشمس من دون الله﴾ لەڕووی بیروباوەڕیشەوە دیتم کە خۆیی و گەلەکەی لەباتی خوا کڕنووش بۆخۆر دەبەن ﴿وزین لهم الشیطان اعمالهم﴾ و شەیتان کارەکانی لەپێش چاوشیرین کردوون ﴿فصدهم عن السبیل﴾ بەوەش ڕێگای ڕاستیی لێگرتوون ﴿فهم لا یهتدون﴾ ئیتر ڕێی هەق دەرناکەن ﴿[٢٥] الا یسجدوا لله الذی

﴿يخرج الخبأ في السموات والأرض﴾ دەبوو كڕنووش نابەن بۆ ئەوخوایە كەشتی شاراوە -لە ئاسمانەكان و زەویدا- بە دیار دەخا ﴿ويعلم ما تخفون وما تعلنون﴾ دەشزانێت چیدەشارنەوەو، چیش ئاشكرا دەكەن لەرازو نیاز, لە تۆمەو دانەوێڵە ﴿[٢٦] الله لا إله إلا هو رب العرش العظيم﴾ ئەوزاتەی كەجگە لەخۆی,هیچ پەرسراوێكی ترنیەو، پەروەردگارو خاوەنی عەرشی گەورەیە، تەنها ئەو كاروباری بوونەوەری بەدەستە. (تا ئێرە وتەی پەپووەكە بوو).

بەڵێ.. بانگبەرانی خێرو چاكە، هەردەم دەبێ ڕێزیان لێ بگیردرێ، بۆیە پێغەمبەریش ﷺ وەك ئەبووهورەیرە ئەڵێ: ((نهى رسول الله ﷺ عن قتل أربع من الدواب: النملة والنحلة والهدهد والصرد)) رواه الإمام أحمد وأبوداود وإبن ماجة. لە كوشتنی چوار جۆر لەجووڵندە ڕێیگرت: مێرووله، مێشە هەنگ، پەپووسلێمانە، ئەو جۆرە چۆلەكانەیش كە سەرو دەنووكیان گەورەیەو (حشرات) و جانەوەر دەخۆن. ﴿[٢٧] قال سننظر أصدقت أم كنت من الكاذبين﴾ سولەیمان ﷺ وتی بەپەپوو: ئێمە لەم گوفتارەی تۆ دەكۆڵینەوە، تا بزانین ڕاستت وت و لەڕاستگۆیانی، یان لەڕیزی درۆزنانی؟.

## سولەیمان نامە دەنێرێ بۆ بەلقیسی شا:

پاشان سلێمان نامەیەكی نووسیی و، مۆری كردو دایەدەستی پەپوو وتی: ﴿[٢٨] إذهب بكتابى هذا فألقه إليهم﴾ بڕۆ ئەم نامەیەم ببە ولەشوێنێكی بەرچاودا بۆیان فڕێ بدە ﴿ثم تول عنهم﴾ پاشان بگەڕێ دواوەو لەشوێنێكا خۆت حەشار بدە لێیان با نەتبینن ﴿فانظر ماذا يرجعون﴾ ئینجا سەرنج بدە وەڵامیان چیەو لەناو خۆیاندا چ ڕەدێك ئەدەنەوە, جا پاش ئەوە پەپوسلێمانە نامەكە لەسولەیمان وەرئەگرێو، دەیبات بۆ بەڵقیس و، ئەیخاتە كۆشیەوە ﴿[٢٩] قالت يا أيها الملأ إنى ألقى إلى كتاب كريم﴾ دوای ئەوە كە پەپوسلێمانەكە نامەكەی گەیاندو بەڵقیس خوێندیەوە، ئیتر دەست بەجێ پیاوانی پلەداری سوپاو مەملەكەتەكەی كۆكردەوەو وتی: ئەی گەورە پیاوانی مەملەكەت وپلەدارانی سوپا! بەڕاستیی من نامەیەكی ڕێزدارو گرنگ و پیرۆزیان بۆهاوێشتووم. (مەراغیی) ئەڵێت: دیارە پەپووسلێمانەكە زۆر بەپەلە نامەكەی گەیاندووە، زۆریش وریاو هۆشیار بووە، توانیویەتی لێیان تێبگات، شاژن بەڵقیس پێ ئەچێ دەستەیەك لە وەرگێڕانی لابووبێ.. بۆیە خێرا نامەكەیان بۆ وەرگێراو تێیان گەیاند، بەڵێ هەموو نوێنەرو وەفدێك ئەبێ بۆماوەیەك كوڕەكە چۆڵ بكات ودەرفەتێك بدەن بەوانەی كە نامەیان بۆ بردوون، تا لەناو خۆیاندا مەشوەرەتێ بكەن و، بكۆڵنەوەو ئەنجامێك بەدەست بێنن. ﴿إنه من سليمان﴾ كە بەڕاستیی نامەكە لە سولەیمانەوە هاتووە ﴿[٣٠] وإنه بسم الله الرحمن الرحيم﴾ لەپاشا نامەكەی خوێندەوە بۆیان و وتی ئەم نامەیە تیانووسراوە(بسم الله الرحمن الرحيم) واتە:دەبێ هەموو كارو بارێك تەنها بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبانەوە بكرێت ﴿[٣١] الا تعلوا على وأتونى مسلمين﴾ وخۆتان بەبەرز مەگرن و دەعیەو فیز بەسەر مدامەكەن -وەك باوی پاشاكان- وەرن موسڵمان بن و، واز لەخۆرپەرستیی بێنن. بەڵێ ئەگەرچی نامەیەكی زۆر كورت بوو، بەڵام گەڵێ كاروباری ئایین ودونیایانی تێدا بوو.

## بەلقیس مەشوەرەت دەكا بە پیاو ماقوڵان:

﴿[٣٢] قالت يا أيها الملأ افتونى فى أمرى﴾ ئینجا بەڵقیس وتی: ئەی كۆمەڵی باڵای مەملەكەت! ڕای خۆتان دەربڕن , سەبارەت بەو نامەیە هاتووە بۆم چیبكەم باشە؟ ﴿ماكنت قاطعة أمرا حتى تشهدون﴾ من قەت بێ ئامادەبوون و ڕاوەرگرتن و ڕەزامەندی ئێوە بڕیارم لەسەر هیچ شتێك نەداوە, دیارە لەم ڕاوەرگتنەدا ژیریی و هۆشیاریی ئەو ئافرەتە شایە دەرئەكەوێ.. خۆئەمیش - مەشوەرەت وڕاوێژ- بنەمایەكی زۆر گەورەو گرنگە لە

ئیسلامدا ﴿[٣٣] قالوا نحن اولوا قوة واولوا بأس شديد﴾ ئەنجوومەنەکەی وتیان: ئێمە خاوەن هێزو دەسەلاتێکی سەختی تەواویی جەنگیین ﴿والأمر إليك فانظرى ماذا تأمرين﴾ فەرمانیش بۆتۆیە, تەماشا بکەو, تێفکرە بەچی فەرمانمان پێ ئەدەیت ﴿[٣٤] قالت إن الملوك إذا دخلوا قرية أفسدوها﴾ بەلقیس کاتێ هەستی کرد کە ئەنجوومەنەکەی حەزیان لەجەنگە، ویستی ڕێگای ڕاستییان بۆ روون بکاتەوە، بۆیە وتی: بێگومان پاشایان هەر کاتێ بەجەنگ بچنە هەر شارو ئاوەدانیەکەوە, خراپ و وێران وکاولی دەکەن ﴿وجعلوا اعزة أهلها اذلة﴾ و بەرێزان و پیاوماقوڵانی ئەو شوێنەش بە کوشتن ودیل کردن و تاراندن و زەلیل و بێ ڕێزدەکەن ﴿وكذلك يفعلون﴾ هەر ئاوا بوون و، هەر بەوجۆرەدەکەن، بەلقیس حەزی بەئاشتییەو ,دەشیەوێ سولەیمان تاقی بکاتەوە بزانێ پێغەمبەری,یان پاشایە بۆیە دەڵێ ﴿[٣٥] وإنى مرسلة إليهم بهدية﴾ وامن دیارییەکی بەنرخیان بۆدەنێرم ,بزانم پاشایە، یان پەیامبەرە؟ چونکە ئەگەر وەری نەگرت و، گوێی لە ماڵ وسامان نەبوو، دیارە بێگومان ئەوە پەیامبەرەو، هەر ئەبێ ئێمەش پەیرەوی لێ بکەین و، بچینە سەر ئایینەکەی ﴿فناظرة بم يرجع المرسلون﴾ ئەوساچاوەروان دەبم بزانم نێرراوەکان بەچیەوە ئەگەرێنەوە؟ ﴿[٣٦] فلما جاء سليمان قال اتمدونن بمال﴾ جا کاتێ نوێنەرەکەی بەلقیس هاتە لای سولەیمان" بەودیارییەوە بۆی ناردبوو، ئیترسولەیمان زۆر تووڕە بوو و ڕقی هەڵساووتی: ئایا ئەتانەوێ بەسامان ودارایی دونیا هاوکاریم بکەن؟ ﴿فما آتانى الله خير مما آتاكم﴾ شتیی وا، هەرگیز نەگونجاوە، چونکە ئەوسامان ودەسەلاتەی خوا پێیداوم زۆر لەوەی کەبەئێوەی داوە چاکترە ﴿بل انتم بهديتكم تفرحون﴾ نا.. من بەدیاریی وسامانی ئێوە دڵخۆش نیم، بەڵکوئەوە هەرئێوەن کە بەدیاریی‌خۆتان دڵشاد ئەبن ﴿[٣٧] إرجع إليهم﴾ ئەی نوێنەری بەلقیس! بگەڕێرەوە لایان ﴿فلنأتينهم بجنود لا قبل لهم بها﴾



فَلَمَّا جَآءَ سُلَيۡمَٰنَ قَالَ أَتُمِدُّونَنِ بِمَالٖ فَمَآ ءَاتَىٰنِۦَ ٱللَّهُ خَيۡرٞ مِّمَّآ
ءَاتَىٰكُمۚ بَلۡ أَنتُم بِهَدِيَّتِكُمۡ تَفۡرَحُونَ ٣٦ ٱرۡجِعۡ إِلَيۡهِمۡ فَلَنَأۡتِيَنَّهُم
بِجُنُودٖ لَّا قِبَلَ لَهُم بِهَا وَلَنُخۡرِجَنَّهُم مِّنۡهَآ أَذِلَّةٗ وَهُمۡ صَٰغِرُونَ ٣٧ قَالَ
يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَؤُاْ أَيُّكُمۡ يَأۡتِينِي بِعَرۡشِهَا قَبۡلَ أَن يَأۡتُونِي مُسۡلِمِينَ ٣٨
قَالَ عِفۡرِيتٞ مِّنَ ٱلۡجِنِّ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبۡلَ أَن تَقُومَ مِن مَّقَامِكَۖ وَإِنِّي
عَلَيۡهِ لَقَوِيٌّ أَمِينٞ ٣٩ قَالَ ٱلَّذِي عِندَهُۥ عِلۡمٞ مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ أَنَا۠ ءَاتِيكَ
بِهِۦ قَبۡلَ أَن يَرۡتَدَّ إِلَيۡكَ طَرۡفُكَۚ فَلَمَّا رَءَاهُ مُسۡتَقِرًّا عِندَهُۥ قَالَ هَٰذَا
مِن فَضۡلِ رَبِّي لِيَبۡلُوَنِيٓ ءَأَشۡكُرُ أَمۡ أَكۡفُرُۖ وَمَن شَكَرَ فَإِنَّمَا يَشۡكُرُ
لِنَفۡسِهِۦۖ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ رَبِّي غَنِيّٞ كَرِيمٞ ٤٠ قَالَ نَكِّرُواْ لَهَا عَرۡشَهَا
نَنظُرۡ أَتَهۡتَدِيٓ أَمۡ تَكُونُ مِنَ ٱلَّذِينَ لَا يَهۡتَدُونَ ٤١ فَلَمَّا جَآءَتۡ قِيلَ
أَهَٰكَذَا عَرۡشُكِۖ قَالَتۡ كَأَنَّهُۥ هُوَۚ وَأُوتِينَا ٱلۡعِلۡمَ مِن قَبۡلِهَا وَكُنَّا مُسۡلِمِينَ
٤٢ وَصَدَّهَا مَا كَانَت تَّعۡبُدُ مِن دُونِ ٱللَّهِۖ إِنَّهَا كَانَتۡ مِن قَوۡمٖ كَٰفِرِينَ
٤٣ قِيلَ لَهَا ٱدۡخُلِي ٱلصَّرۡحَۖ فَلَمَّا رَأَتۡهُ حَسِبَتۡهُ لُجَّةٗ وَكَشَفَتۡ عَن
سَاقَيۡهَاۚ قَالَ إِنَّهُۥ صَرۡحٞ مُّمَرَّدٞ مِّن قَوَارِيرَۗ قَالَتۡ رَبِّ إِنِّي
ظَلَمۡتُ نَفۡسِي وَأَسۡلَمۡتُ مَعَ سُلَيۡمَٰنَ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٤٤



پێیان بڵێ: دەبێ لەشکرێکیان بۆ بێنم کە نەیان دیبێت و هەر گیز نەتوانن روو بە رووی بووەستن لەکاتی جەنگدا ﴿ولنخرجنهم منها اذلة وهم صاغرون﴾ وە دەبێ لە(سەبا)بە زەلیلی دەریان بکەین سەر شۆڕبن, ئەگەر ملکەچ نەکەن.

## هێنانی تەختەکەی بەلقیس:

جاکە نوێنەرەکانی بەلقیس لای سولەیمان گەڕانەوەو، هەواڵەکەیان بۆگێڕایەوە ﴿[٣٨] قال يأيها الملأ أيكم يأتينى بعرشها قبل ان يأتونى مسلمين﴾ وتی: سوێند بە خوا من هەر ئەمزانی (سولەیمان) پاشا نیەو، ناتوانین زاڵ بین بەسەریا، بۆیە بۆجارێکی تر بەلقیس ناردیەوە بۆلای سولەیمان کەدەمەوێ خۆم وپیاوەگەورەکانی مەملەکەتم سەرتان لێ بدەین و، مەشوەرەتێ بکەین و، بزانین چۆن ئەبێ و، چیت ئەوێ.

هێندێ تەفسیر ئەڵێن: (بەڵقیس) دوازدە هەزار فەرماندەو پیاو هەڵکەوتەی مەملەکەتەی لەگەڵ خۆی برد، سولەیمانیش کە دڵنیابووئەوان دێن، چاودێریی بۆدانان، بۆ ئەوەی کەهەرکە نزیک بووەوە، هەواڵی‌بدەنێ، بۆیەئەمیش گشت ناودارانی سوپاکەی کۆکردەوەو وتی: گەورەوماقوڵان! کامتان ئەتوانێ‌هەرئێستا تەختی پاشایەتییەکەی بەڵقیسم بۆ بێنی، پێش ئەوەی بگەنەلام؟ سولەیمان ئەیەوێ هەندێ لە دەسەڵاتی خوای نیشان بدات کە پێی بەخشیوە، هەتا باشترکار بکاتە سەر بەڵقیس بۆبڕواهێنان ﴿[٣٩] قال عفريت من الجن﴾ دێوێکی زەبەلاح و زۆر بەهێزو بە توانا لە جنۆکەکان وتی: ﴿أنا آتيك به قبل ان تقوم من مقامك﴾ ئەمن پێش ئەوەی لەجێچگەی خۆت هەڵسیت ودەوام تەواوبێت بۆتی دێنم. (سوودی)دەڵێ: هەموو ڕۆژێ هەرلەبەیانی تا نیوەڕۆ لە سەر تەختی دادگا دادەنیشت، واتە: من لەو ماوەیەدا فریات ئەخەم ﴿وإني عليه لقوي أمين﴾ وە من بۆ ئەوکارە بە هێزودەست پاکم،ئامادەم هەروەکو خۆی بیهێنمە بەردەستت ﴿[٤٠] قال الذي عنده علم من الكتاب﴾ بەڵام یەکێ لەوانەی کە شارەزایی لە کتێبی ئاسمانی هەبوو- ئیتر سولەیمان خۆی بووبێ، یا خود پیاوێکی تری‌صالح بووبێ، یان زانایەك بووبێ لەجنیەکان- وتی: ﴿أنا آتيك به قبل ان يرتد إليك طرفك﴾ من پێش ئەوەی چاو بنێیت بە یەکا بۆتی‌دێنم، بەڵێ لە ماوەی چاوتروکانێکا عەرشەکەی بەڵقیسی هێنایە بەردەستی، ئیتر ئایا چۆنی هێنا؟ چی بەکارهێنا؟ چی ئەزانی؟ هیچ جۆرە شتێك لەوانە لەقورئانەکەدا دیاری نەکراوە، دڵنیاشبە، ئەگەر پێویست بوایە، خوای‌گەورە ڕوونی دەکردەوە ﴿فلما رآه مستقرا عنده﴾ جا کاتێ سولەیمان دیتی واتەختەکەی بەڵقیس لەلای ئامادەوحازرە ﴿قال هذا من فضل ربي﴾ وتی: ئەمەش هەرلەبەش و بەهرەکانی پەروەردگاری‌منە ﴿ليبلوني أشكر ام اكفر﴾ بۆئەوەی تاقیم بکاتەوە:ئایاسوپاسگوزاریی ئەکەم، یا سپڵە وبەدنمەك و نەزان ئەبم ﴿ومن شكر فإنما يشكر لنفسه﴾ خۆهەر کەسێك سوپاسگوزار بوو، بۆخۆی دەکاو، کەڵکەکەی بۆخۆی ئەگەڕێتەوە ﴿ومن كفر فإن ربي لغني كريم﴾ کێش سپڵەوناشوکربوو، ئەوە بێگومان پەروەردگاری من،خوایەکی بێ نیازەوبەبەخششە. ئیمامی (موسلیم) یش ئەم فەرموودەیەی هێناوە کە: خوای گەورە لەفەرموودەی (قودسیی) دا فەرموویەتی: ((ياعبادي! لو أن أولكم وآخركم وإنسكم وجنكم، كانوا على أتقى قلب رجل منكم، ما نقص ذلك من ملكي شيئا، ياعبادي! لو أن أولكم وآخركم، وإنسكم وجنكم، كانا على أفجر قلب رجل منكم، ما نقص ذلك من ملكي شيئا، يا عبادي! إنماهي أعمالكم أحصيها لكم، فمن وجد خيرا فليحمد الله، ومن وجد غير ذلك فلا يلومن إلا نفسه)).

## سولەیمان ژیریی بەلقیس دە ئەزموێنێ:

﴿[٤١] قال نكروا لها عرشها﴾ بەڵێ، تەختەکەی بەڵقیس هێنرایە بەردەستی سولەیمان و، بەڵقیسیش هەربەڕێوەیە، جا بۆئەوە ژیریی ومەزننەی بیروهۆشی بەڵقیس بۆسلێمان دەرکەوێ وتی: ڕەنگ و ڕووی تەختی پاشایەتیە کەی بۆ بگۆڕن، (موجاهید) دەڵێ: ڕەنگی سووری گۆڕا بەزەرد، زەرد بە سوور، سەوز بەسوور؛ وە هەروەها. (عیکرەمە) دەڵێ: دەسکارییەکی باش کرا. ﴿ننظر أتهتدي أم تكون من الذين لا يهتدون﴾ سەرنج دەدەین ئایا ڕێی پێدەبات و ئەیناسێتەوە وئەزانێ تەختەکەی خۆیەتی" یان ڕێی پێ نابات و نایناسێتەوە ﴿[٤٢] فلما جاءت قيل أهكذا عرشك﴾ کاتێ شاژن هات و گەیشت، پێی وترا: ئایا تەختی پاشایەتی تۆوابوو؟ ﴿قالت كأنه هو﴾ ئەویش زۆر بە ژیرانە وەڵامی‌دایەوەو وتی: هەردەڵێی‌خۆیەتی، بە تەواوی‌ددانی پیادا نەنا، هەرچەندە زۆر لەوئەچوو" ﴿وأوتينا العلم من قبلها وكنا مسلمين﴾ ئێمە پێش ئەمەش ئاگادار کرابووین دەربارەی دەسەڵاتی سولەیمان، وهەر گوێ‌بەفەرمان وتەسلیم بووین ﴿[٤٣] وصدها ما كانت تعبد من دون الله﴾ وەئەوەش ،(واتە: خۆر)بوو کە (بەڵقیس) لەباتی‌خوا

دەپیەرست ،ئەوی گێڕایەوە لە باوەڕهێنان بەخوا ﴿إنها كانت من قوم كافرين﴾ چونكە بە راستیی كاتی خۆی ئەولەگەل وكۆمەڵێكی بێ باوەڕبوو، واتە: تا نەهاتە لای سولەیمان موسڵمان نەبوو ﴿٤٤ قيل لها ادخلى الصرح﴾ جاپێش ئەوەی بەڵقیس بگاتە لای سولەیمان كۆشكێكی سەیری بۆئامادە كردو شووشە پۆشی كردو، لە ژێریشییەوە ئاوو رووبار ئەهات ودەڕۆیشت، ماسیی وشتی دەریایی بەنێویا هاتووچۆیان دەكرد، بۆئەوەی دەسەڵاتی خۆی پێنیشان بدات! جائەوەبوو كەموڵك ودەسەڵاتەكەی سولەیمانی دییت، ئەوسا ملكەچ بوو بەفەرمانی خواو، بۆیشی دەركەوت سولەیمان پێغەمبەری خوایە. ئیمامی (ئیبن كەسیر) ئەڵێ: ئەو ریوایەتانەی بەجۆری تر هێنراون لەبارەی هۆی لاق هەڵكردنی بەڵقیس: (منكر وغريب جدا) پاشانیش ئەڵێ: ئەشگونجێ لە گومان و وەهمی

الجزء التاسع عشر | سورة النمل

وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَآ إِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمۡ صَٰلِحًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ فَإِذَا
هُمۡ فَرِيقَانِ يَخۡتَصِمُونَ ﴿٤٥﴾ قَالَ يَٰقَوۡمِ لِمَ تَسۡتَعۡجِلُونَ
بِٱلسَّيِّئَةِ قَبۡلَ ٱلۡحَسَنَةِۖ لَوۡلَا تَسۡتَغۡفِرُونَ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ
تُرۡحَمُونَ ﴿٤٦﴾ قَالُواْ ٱطَّيَّرۡنَا بِكَ وَبِمَن مَّعَكَۚ قَالَ طَٰٓئِرُكُمۡ
عِندَ ٱللَّهِۖ بَلۡ أَنتُمۡ قَوۡمٞ تُفۡتَنُونَ ﴿٤٧﴾ وَكَانَ فِي ٱلۡمَدِينَةِ تِسۡعَةُ
رَهۡطٖ يُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا يُصۡلِحُونَ ﴿٤٨﴾ قَالُواْ
تَقَاسَمُواْ بِٱللَّهِ لَنُبَيِّتَنَّهُۥ وَأَهۡلَهُۥ ثُمَّ لَنَقُولَنَّ لِوَلِيِّهِۦ مَا شَهِدۡنَا
مَهۡلِكَ أَهۡلِهِۦ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴿٤٩﴾ وَمَكَرُواْ مَكۡرٗا
وَمَكَرۡنَا مَكۡرٗا وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ﴿٥٠﴾ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ
كَانَ عَٰقِبَةُ مَكۡرِهِمۡ أَنَّا دَمَّرۡنَٰهُمۡ وَقَوۡمَهُمۡ أَجۡمَعِينَ
﴿٥١﴾ فَتِلۡكَ بُيُوتُهُمۡ خَاوِيَةَۢ بِمَا ظَلَمُوٓاْۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ
لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ﴿٥٢﴾ وَأَنجَيۡنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ
وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ﴿٥٣﴾ وَلُوطًا إِذۡ قَالَ لِقَوۡمِهِۦٓ
أَتَأۡتُونَ ٱلۡفَٰحِشَةَ وَأَنتُمۡ تُبۡصِرُونَ ﴿٥٤﴾ أَئِنَّكُمۡ لَتَأۡتُونَ
ٱلرِّجَالَ شَهۡوَةٗ مِّن دُونِ ٱلنِّسَآءِۚ بَلۡ أَنتُمۡ قَوۡمٞ تَجۡهَلُونَ ﴿٥٥﴾

٣٨١

(عەتای كوڕی سائیب)بێ، بەرامبەر بە (ئیبن عەباس). بەڵێ كاتێ هاتەپێشەوە، پێی وترا: وەرە نێوكۆشكەوە ﴿فلما راته حسبته لجة﴾ جا كە مەلیكە لێیڕوانیپێی وابوو ئاوێكی زۆروزەبەندە، كە ئەگەر بەسەریا بروا لاقی تەڕئەبێت ﴿وكشفت عن ساقيها﴾ بۆیە هەردوولاقی خۆی هەڵكرد (وپاوو پووزی دەركەوت) تا لە ئاوەكە بپەڕێتەوەو لاقی تەڕنەبێ ﴿قال إنه صرح ممرد من قوارير﴾ سولەیمان بەبەڵقیسی وت: بەراستی ئەوپانتایی كۆشكە تۆدەیبینیت شووشە بەندەو ئاونیە، واتە:پێویست ناكات لاقت هەڵبكەیت ﴿قالت ربى إنى ظلمت نفسى﴾ بەڵقیسیش كە ئەوكۆشك وتەلارو دەسەڵاتەی چاوپێكەوت وتی: ئەیپەروەردگاری من! بێگومان من تائێستا ستەمم لەخۆم كردووە" كە خۆرم پەرستووە" ﴿واسلمت مع سليمان لله رب العالمين﴾ وەلە ئیستاوە لەگەڵ سولەیماندا ملكەچ و تەسلیمی خوای پەروەردگاری جیهانەكان بووم.دەسائێوەش ئەی سەرزلەكانی قورەیش! دەعیە نەتانگرێ كە باوەڕ بێنن بەئاییینی ئیسلام وموحەممەد بكەنە پێغەمبەری خۆتان,و هەردوو پێكەوە ملكەچی خوابن,ئەها بەڵقیس سولەیمانی قبووڵ كرد بەپێغەمبەر, هەردووش پێكەوە ملكەچی خوابوون.

## نێوان صاڵح و (سەموود):

جا دێتە سەرباسی داستانی سێیەمی سورەتەكە (صالح پێغەمبەر عليه السلام) بە كورتەیەك ئەفەرموێ: ﴿٤٥ ولقد ارسلنا إلى ثمود اخاهم صالحا ان اعبدوالله﴾ بێگومان ئێمە براكەیانمان (صالح) ناردەلای هۆزی سەموود وپێی وتن: تەنها خوا بپەرستن ﴿فإذا هم فريقان يختصمون﴾ كەچی ئەوان لەبەرامبەر ئەوقسەوە بوونە دوودەستەی دژبەیەك: موسڵمان وبێ باوەڕ، جا لەنێوانیاندا بووبە قرەقرو دەمەقاڵێ سەبارەت بەو بەرنامەیە بۆی هێنابوون: (قال الملأ الذين استكبروا من قومه للذين استكبروا إنا بالذى آمنتم به كافرون) (٧/٧٥-٧٦) ﴿٤٦ قال ياقوم لم تستعجلون بالسيئة

قبل الحسنة﴾ صالحیش ﷺ وتی: ئەی قەوم وهۆزیمن! بۆچیتالووکە دەکەن بەسزا,پێش چاکەو رەحمەت؟ واتە: لەباتی داوای سزا وبەلا، داوای فەزل و رەحمەتی خوا بکەن؟ ﴿لولا تستغفرون الله لعلكم ترحمون﴾ بۆچی داوای لێبوردن لەخوا ناکەن بۆخۆشبوون لەگوناهەکانتان, بەلشکو رەحمەتان پێ بکرێ ولێتان خۆشبێ ﴿[٤٧] قالوا اطيرنا بك وبمن معك﴾ کەچی دوای ئەوهەمووئامۆژگاریەیان وتیان: ئێمەش تۆو وئەوکەسەش کەلەگەل تۆن, بەمایەی شوم و بەدکاری دەزانین, واتە: ئەم گرانیی وقات و قڕیی و نەگبەتیە هەرلەنێو چاوانی ئێوەی ئەناسین ﴿قال طائركم عند الله﴾ ئەویش وتی: نەخێر.. سالی نەهاتتان و، شووم ونەگبەتیتان لای خوایە ﴿بل انتم قوم تفتنون﴾ بەلکو ئێوە قەوم وهۆزێکن تاقی ئەکرێنەوەو لەژێر چاودێرییدان وتاقیدەکرێنەوە، ئایا کاری چاکە ئەکەن، یان کاری خراپە.

## فرت و فێلی سەموودو چارەنووسیان:

﴿[٤٨] وكان في المدينة تسعة رهط﴾ لەوشارەی صالحدا (حیجر) نۆ دەستە دەسەلاتدارو سەرۆکی نەگونجاو هەبوون ﴿يفسدون في الأرض﴾ گوناح و خراپەکارییان دەکرد لەزەوییدا ﴿ولا يصلحون﴾ بەلایچاکەدا نەئەچوون، فەساد ببوویە پیشەیان ,هەر بەفەرمانی ئەوانیش بوو وشترەکەیان کوشت! ﴿[٤٩] قالوا تقاسموا بالله﴾ جا وەك (ئیبن عەباس)دەلێ: دوای کوشتنی وشترەکە مەشۆرەتیان بەیەکترکردو سوێندیان بەخوا بۆیەکترخوارد ﴿لنبيتنه وأهله﴾ کە ئەمشەو صالح و ژن ومنالی لەناویان دەبەین ﴿ثم لنقولن لوليه﴾ لەپاشان ئەگەر گومانێکیان لێکردین بەخاوەن خوێنەکەی ئەلێین: ﴿ما شهدنا مهلك أهله﴾ ئەوخێزانە کە کوژراون، ئاگامان لێنەبوو ﴿وإنا لصادقون﴾ دلنیاشبە راستیش ئەکەین، بەلێ هەلسان و رۆیشتن و گەمارۆی مالی صالحیاندا ﷺ، بەلام پێش ئەنجامدانی کارەکەیان، بەفەرمانی خوا فریشتە ئەوانیان بەردە باران کرد وتیاچوون، وەك ئەفەرموێ: ﴿[٥٠] ومكروا مكرا﴾ ئەوتاوانبارانە فرت وفێلێکیان ئەنجامدا بۆ کوشتنی صالح ﴿ومكرنا مكرا﴾ ئێمەش پلانێکمان سازاند، واتە: ئێمەش نەخشەیەکی گرنگمان دارشت بۆلەناو بردنیان ﴿وهم لايشعرون﴾ کە ئەوان ئاگایان لێ نەبوو ﴿[٥١] فانظر كيف كان عاقبة مكرهم﴾ سا بنۆرە وبیربکەوە، بزانە سەرەنجامی پیلان و کەتن وفێلەکەیان چۆن بوو؟ ﴿انا دمرناهم وقومهم أجمعين﴾ کە بێگومان ئێمە بەوانیشەوە هۆزەکەیانمان پێکرا لەناوبرد بەهۆی زەمین لەرزەوە ﴿[٥٢] فتلك بيوتهم خاوية بما ظلموا﴾ دوای قەلاچۆکردنیان خوا ئەفەرموێ: ئەوەش خانووەکانیان دەیان بینیکاول وچۆلن لەبەرستەم وناهەقییان ﴿إن في ذلك لآية لقوم يعلمون﴾ بە راستیی لەوەدابەلگە هەیە – لەسەر دەسەلاتی خوا– بۆ گەلێك بزانێ و پەند وەربگرێ ﴿[٥٣] وانجينا الذين آمنوا وكانوا يتقون﴾ ئەوە ئەنجامی بێ باوەران بوو، ئەوانەش کە بڕوایان هێنابوو و پارێزکاربوون، رزگارمان کردن, واتە: ئەی موحەممەد ﷺ هەر ئاواش ئەتوانین بێ بڕواکانی سەردەمی تۆش لەناو ببەین و، خۆت و بڕوادارەکان رزگار بکەین.

ئنجا داستانی چوارەم: کە باسی پێغەمبەر لووطە ﷺ..دێت، وەك ئەفەرموێ: ﴿[٥٤] ولوطا إذ قال لقومه﴾ باسی (لووط) یش بکە، کاتێ کە بەگەلەکەی خۆی وت, بۆ ئەوەی بێدارو هۆشیار ببنەوەو، لە سزای خوا بترسن ﴿أتأتون الفاحشة﴾ ئایا ئێوە کاری زۆر دزێوو نێربازیی ئەنجام دەدەن؟ کە تائێستا ئێوە نەبێ، هیچ کەسێك ئەوکارەی نەکردووە ﴿وانتم تبصرون﴾ وەخۆیشتان ئەبینن وئەزانن ئەوجۆرەکارانە چ کارێکی بەدوناشیرینن ﴿[٥٥] إنكم لتأتون الرجال شهوة من دون النساء﴾ ئایا رەوایە ئێوە ئارەزووی سیکسی خۆتان لای پیاوان ئەنجام دەدەنووازتان لە ژنان هێناوە؟! خۆ بۆئەنجامدانی ئەوکارە خوا ژنانی داناوە، ئەویش پاش ئەوە بەشێوەی شەرعی

مارەبكرێن ﴿بل انتم قوم تجهلون﴾ بەڵكو ئێوە هۆزوكۆمەڵە خەڵكێكن خۆتان نەزان ئەكەن , كەپێتان وایە پیاوان جێی ئەنجامدانی ئارەزووی سێكسین!

كۆتایی جزمی نۆزدەیەم
و لله الحمد والمنة
*** *** ***

﴿٥٦ فما كان جواب قومه إلا أن قالوا أخرجوا آل لوط من قريتكم﴾ وەڵامی هۆزەكەی تەنها ئەوەندە بوو كە بەیەكتریان وت: لووط و شوێنكەوتوانی ئەو، لەشارو وڵاتەكەتان (سەدووم) دەركەن ﴿إنهم أناس يتطهرون﴾ چونكە ئەوانە خەڵكانێكن خۆیانبە پاكن رادەگرن و، لەو كارەی ئێمە بێزارن! واتە: گوایە لافیپاكی لێدەدەن و، ئەوكارە ئێمە دەیكەین ئەوان بەتاوانی دادەنێن! ﴿٥٧ فأنجيناه واهله إلا امرأته قدرناها من الغابرين﴾ ئینجا ئێمە لوط و خانەوادە كەیمان رزگاركرد، جگە لەژنەكەی، چونكە بریارماندا ئەولەریزی باقی بێ باوەرەكاندا بمێنێت تائەویش لەتەكیاندا تیابچێت" بەڵێ.. بەهۆی سەرپێچی ئافرەتەكە خۆیەوەو، رازی بوونیشی بەو كارانە كە ئەو خەڵكە ناپاكانە، ئەیانكردو، دركاندنی نهێنی هاتنی میوانەكانی لوت لەلای خزمەكانی، خوا لەناوی برد ﴿٥٨ وامطرنا عليهم مطرا﴾ وبارانێكمان بەسەریاندا باراند, بەلاّم چ بارانێك، واتە: بەردەبارانمان كردن،چ بەردە بارانێك, وەك ئەفەرموێ: (حجارة من سجيل منضود مسومة عند ربك وماهي من الظالمين ببعيد)١١/١٨٣. ﴿فساء مطر المنذرين﴾ ئای چ سەخت وگران ودژواربوو بەردە بارانی ترسێنراوەكان ,بەلاّم چ سوودێكیان لێ وەرگرت!. لەسوورەی (ئەعراف) و(هوود) یشدا ئەورووداوە,پتر لێرەروونكراوەتەوە.

الجزء العشرون — سورة النمل

﴿ فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَخْرِجُوٓاْ ءَالَ
لُوطٍ مِّن قَرْيَتِكُمْۖ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ ﴿٥٦﴾ فَأَنجَيْنَٰهُ
وَأَهْلَهُۥٓ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ قَدَّرْنَٰهَا مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿٥٧﴾ وَأَمْطَرْنَا
عَلَيْهِم مَّطَرًاۖ فَسَآءَ مَطَرُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴿٥٨﴾ قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ وَسَلَٰمٌ
عَلَىٰ عِبَادِهِ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَىٰٓۗ ءَآللَّهُ خَيْرٌ أَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٥٩﴾
أَمَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ
مَآءً فَأَنۢبَتْنَا بِهِۦ حَدَآئِقَ ذَاتَ بَهْجَةٍ مَّا كَانَ لَكُمْ
أَن تُنۢبِتُواْ شَجَرَهَآۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِۚ بَلْ هُمْ قَوْمٌ يَعْدِلُونَ ﴿٦٠﴾
أَمَّن جَعَلَ ٱلْأَرْضَ قَرَارًا وَجَعَلَ خِلَٰلَهَآ أَنْهَٰرًا وَجَعَلَ لَهَا
رَوَٰسِيَ وَجَعَلَ بَيْنَ ٱلْبَحْرَيْنِ حَاجِزًاۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِۚ بَلْ
أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٦١﴾ أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ
وَيَكْشِفُ ٱلسُّوٓءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَآءَ ٱلْأَرْضِۗ أَءِلَٰهٌ
مَّعَ ٱللَّهِۚ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴿٦٢﴾ أَمَّن يَهْدِيكُمْ فِي
ظُلُمَٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَمَن يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَيْ
رَحْمَتِهِۦٓۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِۚ تَعَٰلَى ٱللَّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٣﴾

أَمَّن يَبْدَؤُاْ ٣٨٢

**شوكرانەی خواو، درووود بۆ عەبدە هەڵبژاردەكان:**

لەپاش باسكردنی داستانی دەستەیەك لەپەیامبەران -عليهم الصلاة والسلام- ئەوجا هەندێ لەتوانایی و دەسەڵاتی خۆی باس ئەكات: ﴿٥٩ قل الحمد لله وسلام على عباده الذين اصطفى﴾ ئەی موحەممەد ﷺ! بلێ: سوپاس و ستاییشی تەواو هەر بۆ خوای میهرەبان، لەبەرامبەر لەناو بردنی بێ بروایاندا, سلاّوودروودیش لەسەر ئەوبەندانەی خۆی هەڵبیژاردون, بۆهەڵگرتن وگەیاندنی پەیامەكەیخۆی، (سوددیی و، سەوریی و، ئیبن عەباس دەڵێن: مەبەست بەو هەڵبژێرراوانە هاوەڵانی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وعلى آله وصحبه اجمعين).

بەڵێ زاناکان ئەڵێن: الحمدلله وسەلاوات لەپێش هەموو کارێکی چاکەوە، شتێکی زۆرجوانە! هەربۆیە ئێستاش وتارخوێنەکان بەوانە دەست پێ ئەکەن. ﴿آلله خير اما يشركون﴾ ئایا ئەوخوای تاك وتەنیایە چاکترە.. بپەرسترێت، یائەوبتانە کەئەیانکەنە شەریك وهاوبەشی ئەو؟!

## هەندێ بەڵگە بۆ تاك وتەنیایی خوا:

لەم ئایەتانەشدا خوای دلۆڤان بەڵگە گەلێ لەسەر تاك وتەنیایی خۆی دێنێتەوە: ﴿[٦٠] أمن خلق السموات والأرض﴾ یاخۆ کییەئاسمانەکان وزەوی بەدی هێناوە؟. (ئیبن کەسیر) ئەڵێ: (أمن) فی هذه الآيات كلها تقديره: أمن يفعل هذه الأشياء كمن لايقدر على‌شىء منها؟). ﴿وانزل لكم من السماء ماء﴾ لەلای سەرووشتانەوە ئاوێکی بۆئێوەباراندووە؟ ﴿فأنبتنا به حدائق ذات بهجة﴾ ئنجا بەو ئاوەچەندان باخ وباخچەی جوانمان رواند﴿ماكان لكم ان تنبتوا شجرتها﴾ ئێوە نەتاندەتوانی –تەنانەت– درەختەکەیشی بڕوێنن ,چ جای ئەوە بتوانن بەرهەمەکەی وە بەر بێنن ﴿إله مع الله﴾ دە ئایا پەرستراوێکی‌تر لەگەڵخوادا هەیە ,شایستەی پەرستن بێ و، بتوانێ ئەو کارانە بکا، تائێوەچەواشەبێن و بیکەنە شەریك وهاوەڵی خوا؟! ﴿بل هم قوم يعدلون﴾ نەخێرنیە،بەڵکو لەگەڵ ئەوهەموو بەڵگانەدا ئەوانەخەڵکێکن لە یەکخوا پەرستی لادەدەن,و هاوتابۆخوا دائەنێن وئەیکەنە شەریك وهاوبەشی ﴿[٦١] أمن جعل الأرض قرارا﴾ یا خۆکێ یە زەویی‌کرد بە جێگایەکی ئارام ,بۆمرۆڤ وئاژەڵ وپەلەوەرەکان؟ ﴿وجعل خلالها انهارا﴾ و لەنێوان شیوو دۆڵەکانیشدا چەندان جۆگەو رووباری دانا بۆتان ﴿وجعل لها رواسى﴾ وچەندان شاخ و چیای بتەویشی بۆ زەویی دامەزراند، تا لە لەرزەوجموجوڵی نائاسایی خۆی بکەوێت ﴿وجعل بين البحرين حاجزا﴾ و لەنێوان ئەودوو دەریا، (سوێرو شیرین)ەدا بەرزەك وبەرهەڵستێکی‌دانا تاتێکەڵ بەیەکتر نەبن ﴿إله مع الله﴾ ئایا پەرستراوێکی تر لەگەڵ خوادا هەیە،بەشداری بکات لەو کارانەیدا؟ دیارە کەهەرگیزشتی‌واناگونجێت,کەوابووبۆ بتان ئەپەرستن؟! ﴿بل اكثرهم لا يعلمون﴾ نەخێرنییە،کەچی لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگانەدا هێشتای زۆربەیان گەورەیی خواو، یەك تاکی ئەو نازانن و راستییەکان دەرك ناکەن، بۆیە شەریك و هاوەڵی بۆ دائەنێن!! ﴿[٦٢] أمن يجيب المضطر إذا دعاه﴾ یاخۆکێیە وەلامی هاوارو نزای لێقەوماوو داماوو ناچارو هەژار دەداتەوە، کاتێ کە داوای بەهانا هاتنی لێ بکا و، هانای پێ ببات ﴿ويكشف السوء﴾ ئەوبەلاو ناخۆشییە لادەباکە لەسەرشانیانە ﴿ويجعلكم خلفاء الأرض﴾ دەتانکاتە جێنشینی پێشینان لەزەوییدا, کلیلی ئاوەدان کردنەوەی زەویتان دەداتێ؟ ﴿إله مع الله﴾ ئایا لەگەڵ ئەوخوایەدا پەرستراوێکی تر هەیە بتوانێ ئەو کارانە بکا؟! ﴿قليلا ما تذكرون﴾ نیە,بەلام ئێوەکەم پەندوەرئەگرن و بیر ئەکەنەوە!! "بۆیە ئابەو شێوەیە شەریك و هاوبەشی بۆ دائەنێن" ﴿[٦٣] أمن يهديكم فى ظلمات البر والبحر﴾ بتەکانی ئێوە بەتواناو چاکترن، یاخۆ ئەوزاتەی کە لە تاریکییەکانی‌وشکانیی و، دەریادائێوەرێنوین دەکا؟ ﴿ومن يرسل الرياح بشرا بين يدى رحمته﴾ ئەی‌کێ‌لەپێش بارانی‌رەحمەتدا بای‌مزگێنی‌دەنێری؟ ﴿إله مع الله﴾ ئایا لەگەڵ خوایەکی‌ئاواداخوای ترهەیە بتوانێ‌ئەوکارانەبکا؟ ﴿تعالى الله عما يشركون﴾ ئەوخوا یەزۆر بڵندترو بەرزترە لەو شتانەی کە نەفامان دەیکەنە هاوبەشی ﴿[٦٤] أمن يبدؤا الخلق ثم يعيده﴾ بتەکانی ئێوە بەتواناو چاکترن، یان ئەو زاتەی کەلەسەرەتاوە –بێ بنەماو بناغە– دروستکراوەکان بەدی دێنێت، لەپاشان دوای مردن و فەوتان و تیاچوونی، سەر لەنوێ دەیانگێڕێتەوەو وەك خۆیانیان لێ ئەکاتەوە؟ ﴿ومن يرزقكم من السماء والأرض﴾ئەی کێیە لەئاسمان وزەوییەوە رۆزیتان ئەداتێ؟ واتە: لەئاسمانەوە بەهۆی تیشکی خۆرو هەورو بارانەوە، لە زەوییشدا بەهۆی خاکەوەگەنم ودانەوێڵەسەوزدەکا ﴿إله مع الله﴾ ئایا لەگەڵ خوایەکی ئاواداخوای تر هەیە بتوانێ ئەوکارەبکات؟

﴿قل هاتوا برهانكم إن كنتم صادقين﴾ ئەوانە باسكران پێنج بەڵگە بوون بۆ دەسەڵات وتواناوتەنهایی زاتی خوا، ئینجا ئەی موحەممەد ﷺ پێیان بڵێ": باشەئەگەرئێوەلەراست بێژانن، دە بەڵگەتان بێنن بۆراستیی خواكانتان و بۆ دروستی ئەوەكە پێتان وایە خواشەریك وهاوبەشی هەیە.

## هەرخوا غەیب دەزانێ:

موشریكەكان بۆهاتنی رۆژی قیامەت زۆر دەپرسن ،خوایش دەفەرموێ: ﴿[٦٥] قل لا يعلم من فی السموات والأرض الغيب إلا الله﴾ ئەی موحەممەد ﷺ پێیان بڵێ: هیچ كەسێك لەوانەی كە لەئاسمانەكان و زەوییدان – بێجگەلەخوا–ئاگایان لەغەیب نیە ﴿وما يشعرون أيان يبعثون﴾ ونازانن "و هەست ناكەن كەی زیندوو دەكرێنەوەو،كەیش پاداشت وتۆڵەدەدرێن؟جا كەواتەهەرخوا–بەتەنیا– شایستەی پەرستن وگوێڕایەڵییە ، هەرئەویش خۆی دەزانێ قیامەت كەی دێ؟.

ئیمامی(موسلیم) لە خاتوو (عائیشە)وە ئەڵێ: (من زعم أن محمدا يعلم ما فی غد فقد أعظم على الله الفرية، والله تعالى يقول: (قل لا يعلم من فی السموات والارض الغيب إلا الله).

واتە:هەر كەسێ پێی وابێ كە موحەممەد ﷺ دەزانێ سبەینێ چ دەبێ، ئەوە بە هەقیقەت درۆیەكی زۆرگەورەی لە سەر خواوهەڵبەستووە، چونكە خوا ئەفەرموێ: بێجگە لە خودی(الله) كەس غەیب نازانێ. ﴿[٦٦] بل آدراك علمهم فی الآخرة﴾ نا، بەڵكو زانیاریی و زانستیان سەبارەت بەهاتنی رۆژی دواییكۆتاوكورتەونایگاتێ تا ئەوان بپرسن كەی دێت؟ ﴿بل هم فیشك منها﴾ بەڵكو ئەوان هەر لەگوماندان لێی ، بڕوایان پێی نیە بۆیەململانێ ئەكەن ﴿بل هم منها عمون﴾ بەڵكو لەحاستی نابیناو كوێرن، بۆیە وا نكوڵی و ئینكاری ئەكەن! ﴿[٦٧] وقال الذين كفروا إذا كنا ترابا وآباؤنا﴾ ئەو كەسانەی خوانەناس وبێبڕوان وتیان: ئایا كاتێ ئێمەو باوو باپیرانمان "مردین" و بووینە گڵ ﴿ائنا لمخرجون﴾ ئایا دووبارە زیندووئەكرێینەوە وبۆ ژیانێكی تردەردەچینەوە؟! بەلایانەوە شتێكی زۆردوورە بۆیە وتیان: ﴿[٦٨] لقد وعدنا هذا نحن وآباؤنا من قبل﴾ بێگومان ئەوجۆرە بەڵێنە، پێشتر بەخۆمان و باووباپیرانیشمان درا ﴿إن هذا إلا أساطير الأولين﴾ ئەم بەڵێنە هەرئەفسانەی پێشینەكانەو، هیچ هەقیقەتێكی نیە ﴿[٦٩] قل سيروا فی الأرض﴾ بەوبێ باوەڕانە بڵێ: بەسەر زەوییدا بڕۆن وبگەڕێن ﴿فانظروا كيف كان عاقبة المجرمين﴾ ئنجاسەرنج بدەن و بڕوانن، پاشە رۆژی تاوانكارو تاوانباران چۆن بوو؟ مەگەر خوا شارو وڵاتیانی كاول و وێران نەكردوو هەریەكەیانی بە شێوەیەك قار لێ نەگرتن؟ ﴿[٧٠] ولا تحزن عليهم ولا تكن فی ضيق مما يمكرون﴾ هەرگیز تۆ لەوپیلان وفرتوفێڵەیان و لە ڕەتكردنەوەی قسەكانتدا خەفەت مەخۆو دڵتەنگیش مەبە، چونكە تۆ خوات لەگەڵە ﴿[٧١] ويقولون متى هذا الوعد إن كنتم صادقين﴾ ئەو بێ باوەڕانە بەگاڵتەوە



أَمَّن يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَمَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ
أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ قُلْ هَاتُوا۟ بُرْهَٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ٦٤
قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ٱلْغَيْبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَمَا يَشْعُرُونَ
أَيَّانَ يُبْعَثُونَ ٦٥ بَلِ ٱدَّٰرَكَ عِلْمُهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ بَلْ هُمْ
فِى شَكٍّ مِّنْهَا بَلْ هُم مِّنْهَا عَمُونَ ٦٦ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟
أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبًا وَءَابَآؤُنَآ أَئِنَّا لَمُخْرَجُونَ ٦٧ لَقَدْ وُعِدْنَا
هَٰذَا نَحْنُ وَءَابَآؤُنَا مِن قَبْلُ إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ٦٨
قُلْ سِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُجْرِمِينَ
٦٩ وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ وَلَا تَكُن فِى ضَيْقٍ مِّمَّا يَمْكُرُونَ ٧٠
وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ٧١ قُلْ عَسَىٰٓ
أَن يَكُونَ رَدِفَ لَكُم بَعْضُ ٱلَّذِى تَسْتَعْجِلُونَ ٧٢ وَإِنَّ رَبَّكَ
لَذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَشْكُرُونَ ٧٣ وَإِنَّ
رَبَّكَ لَيَعْلَمُ مَا تُكِنُّ صُدُورُهُمْ وَمَا يُعْلِنُونَ ٧٤ وَمَا مِنْ غَآئِبَةٍ
فِى ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ٧٥ إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ
يَقُصُّ عَلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَكْثَرَ ٱلَّذِى هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ٧٦

ئەڵێن: ئەگەر ئێوە ڕاست ئەکەن" زیندوو بوونەوە هەیەو قیامەت دێت" دەباشە، ئەم بەڵێنە کەی پێش دێت؟ ﴿٧٢ قل عسى أن يكون ردف لكم بعض الذى تستعجلون﴾ پێیان بڵێ" ڕەنگە هەندێ لەوژان و سزایەی کە ئێوە بەپەلەن بۆی نزیکتان بێ "بەڵێ.. وەك (قورتوبی) ئەڵێ: ئەوەبوو لەبەدردا خۆیان دیتەوە، کە چییان بەسەرهات"﴿٧٣ وإن ربك لذو فضل على الناس﴾ وە بێگومان پەروەردگاری تۆ سەبارەت بەخەڵك خاوەن فەزڵ و بەهرەیە" ئەوە تا گەڵێ جار وازیان لێ ئەهێنێو، سزایان دوا ئەخا بۆ دوا ڕۆژ ﴿ولكن أكثرهم لايشكرون﴾ بەلاّم زۆربەیان سوپاسگوزاری خوا ناکەن و، بەو فەزڵ و بەهرەیەی نازانن ﴿٧٤ وإن ربك ليعلم ماتكن صدورهم وما يعلنون﴾ بێگومان پەروەردگاری تۆ چاك دەزانێ بەوەی کە لەدڵ و دەروونیاندا دەیشارنەوەو، ئەوەیش ئاشکرای دەکەن ﴿٧٥ وما من غائبة فى السماء والأرض إلا فى كتاب مبين﴾ هەموو شتێکی پەنهان ونادیار لەئاسمان وزەوییدا لەنامەیەکی ڕوون وئاشکرا " لوح المحفوظ"دا تۆمارکراوە، وەك ئەفەرموێ: (ألم تعلم أن الله يعلم مافى السموات والأرض إن ذلك فى كتاب إن ذلك على الله يسير). لەپێشەوە باسی بنەڕەت و سەرەتای دروست بوونی ئادەمیزادی کرد، پاشانیش زیندوو بوونەوەو ڕاستیی و دروستی پەیامی پەیامبەر ﷺ.

الجزء العشرون — سورة النمل

وَإِنَّهُۥ لَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ٧٧ إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِى بَيْنَهُم
بِحُكْمِهِۦ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْعَلِيمُ ٧٨ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ إِنَّكَ عَلَى
ٱلْحَقِّ ٱلْمُبِينِ ٧٩ إِنَّكَ لَا تُسْمِعُ ٱلْمَوْتَىٰ وَلَا تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ ٱلدُّعَآءَ
إِذَا وَلَّوْا۟ مُدْبِرِينَ ٨٠ وَمَآ أَنتَ بِهَٰدِى ٱلْعُمْىِ عَن ضَلَٰلَتِهِمْ إِن
تُسْمِعُ إِلَّا مَن يُؤْمِنُ بِـَٔايَٰتِنَا فَهُم مُّسْلِمُونَ ٨١ ۞ وَإِذَا
الحزب ٣٩ وَقَعَ ٱلْقَوْلُ عَلَيْهِمْ أَخْرَجْنَا لَهُمْ دَآبَّةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ تُكَلِّمُهُمْ أَنَّ
ٱلنَّاسَ كَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا لَا يُوقِنُونَ ٨٢ وَيَوْمَ نَحْشُرُ مِن كُلِّ أُمَّةٍ
فَوْجًا مِّمَّن يُكَذِّبُ بِـَٔايَٰتِنَا فَهُمْ يُوزَعُونَ ٨٣ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُو
قَالَ أَكَذَّبْتُم بِـَٔايَٰتِى وَلَمْ تُحِيطُوا۟ بِهَا عِلْمًا أَمَّاذَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ
٨٤ وَوَقَعَ ٱلْقَوْلُ عَلَيْهِم بِمَا ظَلَمُوا۟ فَهُمْ لَا يَنطِقُونَ ٨٥ أَلَمْ
يَرَوْا۟ أَنَّا جَعَلْنَا ٱلَّيْلَ لِيَسْكُنُوا۟ فِيهِ وَٱلنَّهَارَ مُبْصِرًا إِنَّ فِى
ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ٨٦ وَيَوْمَ يُنفَخُ فِى ٱلصُّورِ فَفَزِعَ
مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُ وَكُلٌّ أَتَوْهُ
دَٰخِرِينَ ٨٧ وَتَرَى ٱلْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِىَ تَمُرُّ مَرَّ ٱلسَّحَابِ
صُنْعَ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ أَتْقَنَ كُلَّ شَىْءٍ إِنَّهُۥ خَبِيرٌۢ بِمَا تَفْعَلُونَ ٨٨

مَن جَآءَ ٣٨٤

### قورئان کێشەی بەنی ئیسرائیل دەخاتە ڕوو:

ئێستاش لەوە باس دەکات کە قورئان چاکترین بەڵگەیە بۆ ڕاستیی پەیامبەر ﷺ، ئەفەرموێ: ﴿٧٦ إن هذا القرآن يقص على بنى إسرائيل اكثر الذى هم فيه يختلفون﴾ بێگومان ئەم قورئانە "کەبۆمان ناردوویت" زۆربەی ئەو شتانەی کەجوولەکە ناکۆکیی وکێشەیانە لەسەری، باسی دەکاو بۆیان، چاکەوایە هەقبوو ئەوانە دوایبکەوتنایە تاهەق وناهەقیان بۆدەرکەوتایە" ﴿٧٧ وإنه لهدى ورحمة للمؤمنين﴾ و بەڕاستیی ئەو قورئانە ڕێنموونی و ڕەحمەت و میهرەبانیی‌یە بۆ بڕواداران، ئەیانگەیەنێتە ئاسۆی سەروەریی و بەختیاریی ﴿٧٨ إن ربك يقضى بينهم بحكمه﴾ بەڕاستیی پەروەردگارت داوەریی دەکات لەنێوان ئەوانەدا –لەڕۆژی قیامەتدا– بە فەرمان و بڕیاری خۆی ﴿وهو العزيز العليم﴾ هەر ئەویشە دەسەڵاتدارو زانا بە هەموو کارو کردەوەی بەندەکانی خۆی ﴿٧٩ فتوكل على الله﴾ جا کەواتە لەتەواوی کاروبارتدا تەوەکولت بەخوابێ ﴿إنك على الحق المبين﴾ چونکە بەڕاستیی تۆ لەسەر هەقە ئاشکراکەیت "هەرچەندە ئەوانە سەرپێچیت لێبکەن، ئینجا لەبڕواهێنانی ئەوانە پێغەمبەر ﷺ بێئومێد دەکات، وەك ئەفەرموێ: ﴿٨٠ إنك لاتسمع الموتى﴾ بەڕاستی تۆناتوانی بەمردووان –بەبێبڕوایان– کەوەك مردوو وانە ببیسێنی, چونکە خۆیان کەڕوکوێر ولاڵ کردووە.

خاوەنی (أضواءالبیان) لەم جێگایەدا ئەڵێت: قسەیپەسەند لای زانایان ئەوەیە کە: مردوو لە گۆڕدا قسە دەبیسێ، چونکە یەکەم: لەو بارەوە فەرموودەیەکی زۆرو زەبەندە هاتووەو (طعن)یش نەکراون، لەولایشەوە نەوتراوە

کە ئەو بیستنەی مردووانە تایبەتە بە کەسێکەوە، یان بەکاتێکەوە. پێشەوا (بوخاریی) ئەڵێت: ((إن نبی الله ﷺ أمر یوم بدر بأربعة وعشرین رجلا من صنادید قریش، فقذفوا في طوی من أطواء بدر خبیث مخبث، وکان إذا ظهر علی قوم أقام العرصة ثلاث لیال، فلما کان ببدر الیوم الثالث أمر براحلته فشد علیها رحلها، ثم مشی وتبعه أصحابه، قالوا: ما نری ینطلق إلا لبعض حاجته، حتی قام علیکفة الرکي فجعل ینادیهم بأسمائهم وأسماء آبائهم: یا فلان ابن فلان! و یافلان ابن فلان! أیسرکم أنکم أطعتم الله ورسوله، فإنا قدوجدنا ربناحقا، فهل وجدتم ما وعدکم ربکم حقا؟ قال: فقال عمر: یا رسول الله ﷺ! ماتکلم من أجساد لا أرواح لها!! فقال رسول الله ﷺ: ((والذي نفسي بیده ما أنتم بأسمع لما أقول منهم)) بەڵێ پەیامبەر ﷺ سوێندی خوارد کە هەرگیز زیندووەکان لە مردووەکان باشتر نابیسن، کەوابوو ئەم فەرموودەیە بە راشکاوی دان بە بیستنی مردوو لە گۆڕدا ئەنێ. دیارەت نەیشی فەرمووە کە ئەم بیستنە تەنها بۆ کوژراوەکانی بەدرە، ئەوەیش (قەتادە) ئەیلێت: کە گوایا خوای گەورە ئەوانەی زیندوو کردووەتەوە، ئەوجا پێغەمبەر ﷺ بانگی لێکردوون، هەر لەخۆیەوە بێ بەڵگە ئەیلێت!!.(عەبدوڵڵای کوڕی عومەر) خوایان لێ ڕازیبێ ئەڵێت: پەیامبەر ﷺ چوەلای بیری (قولەیب)و فەرمووی: ((هل وجدتم ماوعد ربکم حقا؟)) پاشان فەرمووی: ((إنهم الآن یسمعون ما أقول))، دڵنیابن کە ئێستا ئەوانە گوێیان لێیە من چیان پێئەڵێم. دوایی ئەم قسەوباسەیان بۆ خاتووعائشە گێڕایەوە، ئەویش وتی: دەکرێ مەبەستی پەیامبەر ﷺ ئەوە بووبێ لە: ((إنهم الآن لیعلمون أن الذي کنت أقول لهم هو الحق)). کە ئیتر ئێستاچاك ئەزانن ئەوەی کەپێشتر من پێم ئەوتن راستە. وە ئەو ئایەتەی (إنك لا تسمع الموتی..)ی کردە بەڵگە بۆ قسەکەی خۆی"(بوخاریی)ریوایەتی کردووە. بەڵێ لەبەر ئەوەهیچ ئایەتێك نییە کەبێ پێچ وپەنا نەبیستنی مردوولەگۆڕدا رەت بکاتەوە، لەولایشەوە فەرموودە زۆرە بۆبیستنی، کەوابوو ئەوفەرمودانە بەتەئویلی هاوەڵێك لەهاوەڵان رەت ناکرێنەوە، خاتوو (عائشە)یش هەربەبیروبۆچوونی خۆی بەتەنها ئەوەی بەوجۆرە لێك دایەوە، وە پێشەوا (بوخاریی) لەئەنەسەوە ئەگێڕێتەوە: ((إن النبي ﷺ قال: إن العبد إذا وضع فی قبره وتولی عنه أ صحابه، و إنه لیسمع قرع نعالهم، أتاه ملکان فیقعدانه فیقولان ما کنت تقول فی هذا الرجل محمد ﷺ فیقول: أشهدأنه عبدالله ورسوله، فیقال: انظر إلیمقعدك من النار أبدلك الله به مقعدا من الجنة..)). جا ئەم فەرموودەیە بەراشکاویی دان ئەنێت بەوەداکە: مردووەکە تەنانەت تەقەی پێڵاوی خەڵکەکە دەبیسێ، ئیتر هەرئەمە دەبێتە بەڵگە بۆئەوە کەمردوو ببیستێ. وەپێشەوا موسلیمیش هەمان مەبەست دێنێت، بەڵام بەچەند دەستەواژەیەکی تر بۆ پشتگیریی ئەوباسە پشتیوانن. جا کەوابوو ئایەتی: (إنك لا تسمع الموتی..).. (وما أنت بمسمع من فی القبور) لەسەر راست ترین تەفسیر یان دژی ئەوە ناوەستن کە تۆ ناتوانی هەق بەو بێ باوەڕانە ببیسێنی کەخوا دڵی مراندوون وسزایان لەسەر کەوتووە، بەشێوەیەك کە ئەوان کەڵکی لێوەرگرن، بۆ ئەمەیش (ئیبنی تەیمیە) لە (مجموع الفتاوی)دا ئەڵێت: (وقد یعاد الروح إلی البدن في غیر وقت المسألة.. کما جاء عن النبي ﷺ: ((ما من رجل یمر بقبر الرجل الذي کان یعرفه في الدنیا فیسلم علیه إلا رد الله علیه روحه حتی یرد علیه السلام)).لە (سنن)ی ئەبوداودیشدا هاتووە: ((أن النبي ﷺ قال: إن خیر أیامکم یوم الجمعة فأکثروا علي من الصلاة یوم الجمعة ولیلة الجمعة، فإن صلاتکم معروضة علي، قالوا یا رسول الله ﷺ! کیف تعرض صلاتنا علیك وقد رمت؟ قال إن الله حرم علی الأرض ان تأکل أجساد الأنبیاء)). سەرەڕای ئەمەش، هەر بۆپشتگیریی ئەم باسەیە چەندین فەرموودەی ترهەیە، بەڵام باس کردنیان لەم جێگایەدا درێژەئەکێشێت، بێگومان هەموویان ئەوە دەگەیەنن کە مەردوم لەگۆڕدا بە(لەش وبەرۆح) خۆشیی و، ناخۆشیی دەزانێ هەربۆیە پەیامبەر ﷺ فەرمانی بەهاوەڵان کرد

کەسڵاو لەمردووەکان بکەن: ((السلام علیکم أهل الدیار من المؤمنین وإنا إن شاء الله بکم لاحقون، یرحم الله المستقدمین منا ومنکم والمستأخرین، نسأل الله لنا ولکم العافیة، اللهم لاتحرمنا أجرهم ولاتفتنا بعدهم، واغفر لنا ولهم)).(ابن القیم) له کتێبی (الروح)دا ئەڵێت: ئایا مردووان هەست بە سەردانی زیندوان ئەکەن کاتێ دێنە لایان؟ بۆ وەڵامی ئەوپرسیارە ئەم فەرموودەیە ئەهێنێ: ((ما من مسلم یمر علی قبر أخیه کان یعرفه فی الدنیا فیسلم علیه، إلا رد الله علیه روحه حتی یرد علیه السلام)). جگە لەمەیش فەرمودەی تر زۆرە بۆپشتگیریی ئەو باسە" وەك:((مامن رجل یزور قبر أخیه ویجلس عنده إلا استأنس به ورد علیه، حتیٰیقوم)) وە پیشەوا (موسلیم) ئەگێڕێتەوە کە (عەمری کوری عاص) لەسەرەمەرگەکەیدا زۆر گریاوپشتی لەدانیشتوان کردو رووی لەدیوارەکە نا.. پاشان وتی..

(فإذا أنامت فلا تصحبني نائحة ولانار، فإذا دفنتموني فسنوا علي التراب سنا، ثم اقیموا حول قبري قدر ما تنحر الجزور، ویقسم لحمها، حتی استأنس بکم وانظر ماذا أراجع به رسل ربي..) ئینجا (ئیبنی قەیم) ئەڵێت: ئەمە بەڵگەیە کە مردوو زیندوو دەناسێ وپێوەی هۆگر دەبێ.. هەروەها ناوبراو لەسەر باسەکەی دەرواودەڵێت: (ویدل علی هذا أیضا ماجری علیه عمل الناس قدیما وإلی الآن من تلقین المیت فی قبره.. وقد سئل الامام احمد –رحمه الله– فاستحسنه واصبح علیه بالعمل) وە ئەم فەرمودەش دێنێ –هەرچەند لاوازبێت–((إذا مات أحدکم فسویتم علیه التراب فلیقم أحدکم راس قبره فیقول: یا فلان بن فلانة.. اذکر ما خرجت علیه من الدنیا شهادة أن لاإله إلاالله، وأن محمدا رسول الله، وأنك رضیت بالله ربا وبالاسلام دینا، وبمحمد نبیا ورسولا، وبالقران إماما))، پاشان (ابن القیم) دەڵێت: ئەم فەموردەیە هەرچەند سابت نەبوو، بەڵام موسڵمانان لە شارو گوندەکاندا بەردەوام کاریان پێکردووە بە بێ ململانێیەکی ئەو تۆ، وە هەروەها کۆبوونەوەی موسڵمانان خۆرهەڵات و خۆرئاوا بەو هەموو زانا بەرێزانە و ئاگاداربە فەرمودەو فیقە و، بە کار پیکردنی.. ئەوانە هەموو ئەوە دەگەیەنێت کە مردوو قسە دەبیستێ، گومانی نییە (تەلقین)یش بەشیکە لەوە. ئەمە راو بۆ چوونی (شەنقیتی)بوو.﴿ولا تسمع الصم الدعاء﴾ هەروەها ناتوانی بەبێگوێیان بانگەوازەکەت ببیسینی ,چونکە هەق نابیسن وخۆیان کەڕ کردووە ﴿إذا ولوا مدبرین﴾ کاتێ کە پشت لە تۆ بکەن و لە هەق دوور بکەونەوە. دووبارە خوا ئەوە دووپات ئەکاتەوە کە ئەو جۆرەکەسانە توانای هیدایەتیان نیە، وەك ئەفەرموێ: ﴿[٨١] وما انت بهادی العمی عن ضلالتهم﴾ هەرگیز تۆ ناتوانی نابیناو کوێرەکان (واتە بێ باوەرەکان) لە گومراییان بگێڕ یتەوە و، رینماییان بکەیت بۆ رێی ڕاست ودروست ﴿إن تسمع إلا من یؤمن بآیاتنا﴾ بەڵکوتۆ تەنها دەتوانی هەق و راستییەکان هەربە و کەسە , ببیسینی کە ئامادەیی تیا بێت بۆ بڕوا هێنان بە ئایەتەکانی ئێمە﴿فهم مسلمون﴾ جا ئەوان ملکەچی فەرمانەکانی ئێمەش ئەبن.

## هاتنی دەعباکە ،دابة الأرض،:

﴿[٨٢] وإذا وقع القول علیهم﴾ کاتێ کە فەرمانی سزای ئەوانە دراو، بریاریش درا کە قیامەت بێت ﴿اخرجنا لهم دابة من الأرض﴾ ئەوا لە سکی زەوییدا (دابة الأرض)یان بۆدەردەهێنین ﴿تکلمهم أن الناس کانوا بآیاتنا لا یوقنون﴾ قسەیان لەگەڵ ئەکاو ئەڵێ: بەڕاستی زۆربەی ئەم خەڵکە باوەڕیان بەئایەتەکانی ئێمە نەهێناو یەقینیان پێیان نەبوو.

هاتنی (دابة الأرض)، یەکێکە لە نیشانە گەورەکانی ڕۆژی قیامەت. (سەیید قطب) – خوا لێی خۆش بێت – ئەڵێت: لەگەڵێ فەرمووەدەدا باسی (دابة الأرض)، هاتووە، ئەگەرچی هەندێکیشیان ڕەوان وپەسەندن، بەڵام هیچ شێوەیەکی ئەو (دابة)یە باس ناکەن، جالە بەرئەوە پشت بەوفەرموودانەی دیکەش نابەسرێ کە: دەڵێن: درێژی ئەو(دابة الأرض)ـە (٦٠) گەزە، پەڕوباڵ وسمی هەیە! ڕیشی هەیە! سەری وەك سەری گایە، چاوی وەك چاوی

بەرازە، شاخی وەك شاخی بزنە کێوی یە، مل وکلکی وەك بەران وایە، پێی وەك پێی وشترە.. هتد، بەداخەوە زۆربەی (موفەسیرین) بێ سێ و دوو ئەوجۆرەشتانەیان هێناوە، بەلام ئێمە ناتوانین جێ پێیان هە لگرین وپێیان قایل ببین،چونکەهیچ دەقێکی بڕوا پێکراو نیە کە ئەوقسانە بسەلمێنێ، تەنها ئەوەند هەیە کە (دابة الأرض) یەکێکە لە نیشانە گەورەکانی ڕۆژی قیامەت، وەك پێغەمبەرنەفەرموێ: ((لا تقوم الساعة حتى تروا عشرآيات: طلوع الشمس من مغربها، والدخان، والدابة، وخروج يأجوج ومأجوج، وخروج عيسى ابن مريم، والدجال، و ثلاثة خسوف: خسف بالمغرب، وخسف بالمشرق، وخسف بجزيرة العرب، ونار تخرج من قعر عدن تسوق – أو: تحشر – الناس، تبيت معهم حيث باتوا، وتقيل معهم حيث قالوا)) مو سليم وپێشەوا ئەحمەد. واتە: ڕۆژی قیامەت بەرپا نابێت تادە بەڵگەونیشانە نەبینن.. هەڵهاتنی خۆر لەخۆرئاواوە، هاتنی (دابة الأرض) یشی لەودە بەڵگانە ژمارد (ئیبنی کەسیر) دەڵێ: ئەم (دابة الأرض)ە لە ئاخرو ئۆخری دونیاوە پەیدا دەبێ، کاتێ کەخەڵك دەبێتە فەسادکارو ئاینیی ڕاستیخوادەگۆڕنەوە بەرێچکەو بیردۆزی مرۆڤ کردەکان، هەندێ دەڵێن: لە مەککەدا سەرهەڵ ئەدا، هە ندێکی دیکە دەڵێن: لە نزیکی شاری مەککەوە، (ئیبن عەباس) دەڵێ: لە دەورووبەری دۆڵەکانی (توهامە)دا دەبێ. (تەبەریی) دەڵی: ئەو دابەیە پەیدا دەبێ و قسەلەگەڵ خەڵك دەکاودەڵێ: (إن الناس كانوا بآياتنا لا يوقنون).

**حەشری ستەمکاران لە ڕۆژی سەلادا:**

ئینجا دیمەنێکی دوارۆژ باس ئەکا و ئەفەرموێ: ﴿[٨٣] ويوم نحشر من كل أمة فوجا﴾ باسی ئەو ڕۆژە بکە کە ئێمە لە هەموو ئوممەتێك خەڵکێکی زۆر کۆ ئەکەینەوە بۆ حیساب وکیتاب ﴿ممن يكذب بآياتنا فهم يوزعون *[٨٤] حتى إذا جاؤوا﴾ لەوانەی کە لەئایەتەکانمان نکوڵییان ئەکرد، بەدرۆیان دەزانین , ئینجا رادەگیردرێن تاکاتێ هەموو دێن ,ریز دەبن و خڕ دەبنەوە و ئامادەی حیساب و لێکۆڵینەوە دەبن ﴿قال اكذبتم بآياتي﴾ ئەوجا خوا ئەفەرمووێ: ئایا ئێوە نکوڵی ئایەتەکانی ئێمەتان کرد کە بەپێغەمبەرانمان دابوون؟ ﴿ولم تحيطوا بها علما﴾ بێ ئەوەی کە زانستێکتان پێیان بووبێت ﴿أمّاذا كنتم تعملون﴾یاخۆ ئێوە لەدونیادا چیتان دەکرد؟! ئەی نەدەبوو لەم ڕۆژە گەورەیە بترسن، تا بیری بکەنەوەو خۆتان دووچار نەکەن ﴿[٨٥] ووقع القول عليهم بما ظلموا﴾ سەرەنجام بەهۆی شیرکیانەوە بڕیاروفەرمانی سزایان بۆهات وئەوقەیان بوو ﴿فهم لا ينطقون﴾ ئیترهیچ قسەیەکیان بۆناکرێ، واتە: چونکە هیچ بڕووبیانوویەکیان نەماوە، دەمیان مۆردەکرێ و، ناتوانن هیچ قسەیەك بکەن ﴿[٨٦] الم يروا انا جعلنا الليل ليسكنوا فيه والنهار مبصرا﴾ ئایا ئەوانە نابینن کە ئێمە شەومان بۆ ئارامی ئەوان داهێناوتاریك کرد, تا لەهەوڵ و کۆششەکانی ڕۆژیان بحەوێنەوە ,وەڕۆژیشمان بەرووناك داناوە، تاژیان و ژیواریانی تیاپەیدا بکەن؟! ﴿إن في ذلك لآيات لقوم يؤمنون﴾ بەراستیی لەودیاردانەدا چەندین بەڵگەونیشانە هەیە بۆ گەلێك کەئامادەبێ ئیمان وبڕوابێنێ ,چونکە هەرکەسێك تۆزێك لەگۆڕانی شەووڕۆژ بەوردی بیربکاتەوە دەبێ بڕوا بێنێ بە توانایی ودەسەڵاتیخوا.

**ڕۆژەناڵەبارەکانی قیامەت و پاداش و تۆڵە:**

﴿[٨٧] ويوم ينفخ في الصور﴾ ئەوڕۆژە وەبیربێنە ئەی موحەممەدﷺ!کە فووئەکرێ بەشەیپووردا بۆمراندنی هەموان. (قورتوبی) ئەڵێ: (والصحيح فيالصور: أنه قرن من نور ينفخ فيه إسرافيل) قال مجاهد: كهيئة البوق، وقيل: هو البوق بلغةِ أهل اليمن).(ئیبن جریر) ئەڵێ: (والصواب من القول في ذلك عندنا ما تظاهرت به الأخبار عن رسول الله ﷺ انه قال: ((ان إسرافيل قد التقم الصور وحنى جبهته، ينتظرمتى يؤمر ينفخ)) ئیمامی ئەحمەد ٧٣/٣.

﴿ففزع من في السموات ومن في الأرض إلا من شاء الله﴾ جا هەرکەس لەئاسمانەکان و لەزەویدا هەیە ترس و

بیمێکی زۆر دایدەگرێ و هەموو ئەمرن، جگە لەوانە کە ویستی خوا وایە نەترسن و بمێنن "لەنێو فریشتەو پەیامبەران وشەهیدان" ﴿وکل اتوه داخرین﴾ ئیتردوای زیندوو کردنەوە هەموو بەملکەچی و بەزەلیلی دێنەلای ئەو.

بەڵێ (ئیسرافیل)بە فەرمانی خوا لە ئاخرو ئۆخری دونیادا , بۆ ترساندنی خەڵك فوو بەشەیپووردا ئەکاو، ئەوسا ئیترقیامەت لەسەرخراپکاران هەڵئەسێ, ئیتر ئەوکاتە پێغەمبەران و فریشتەکانی نەبێ، تەواوی خەڵکانی ئاسمان وزەویش گشت دەمرن, ئەودیاردەسامناکەیە پێیئەڵێن: (نفخة الفزع)، پاشان بۆجارێکی ترفوودەکرێتەوە بە (صور)دا بۆ مردن (نفخة الصعق)، دیسانەوە بۆ جاری سێهەم بۆ ئامادە بوون لەبەر دەم پەروەردگاردا (نفخة النشور). ئیمامی (موسلیم) ئەم فەرموودەیە دێنێ: ((یخرج الدجال فی أمتي فیمكث أربعین, لا أدری أربعین یوما، أو أربعین شهرا، أو أربعین عاما– فیبعث الله عیسی ابن مریم –كأنه عروة بن مسعود –فیطلبه فیهلكه. ثم یمكث الناس سبع سنین، لیس بین اثنین عداوة، ثم یرسل الله ریحا باردة من قبل الشام، فلا یبقی علی وجه الأرض احد فی قلبه مثقال ذرة من خیر، أو إیمان إلا قبضته، حتی لو أن أحدهم دخل في كبد جبل لدخلته علیه حتی تقبضه. قال: –أی عبد الله بن عمرو –سمعتها من رسول الله ﷺ قال: فیبقی شرار الناس فی خفة الطیر وأحلام السباع، لا یعرفون معروفا، ولاینكرون منكرا، فیتمثل لهم الشیطان فیقول: الا تستجیبون؟ فیقولون: فما تأمرنا؟ فیأمرهم بعبادة الأوثان وهم فی ذلك دار رزقهم، حسن عیشهم، ثم ینفخ في الصور فلا یسمعه أحد إلا أصغی لیتا ورفع لیتا – واللیت: صفحة العنق وهی جانبه–. قال: وأول من یسمعه رجل یلوط حوض إبله – أی یطینه ویصلحه– قال فیصعق، ویصعق الناس ثم یرسل الله –أوقال ینزل الله – مطرا كأنه الطل –أوقال الظل.الطل: المطرالخفیف، –نعمان الشاك– فتنبت منه أجساد الناس، ثم ینفخ فیه أخری فإذا همقیام ینظرون، ثم یقال: یا أیها الناس! هلموا إلی ربكم، وقفوهم إنهم مسئولون. ثم یقال: أخرجوا بعث النار، فیقال: من كم؟ فیقال: من كل ألف تسعمائة وتسعة وتسعین، قال: فذلك یوم یجعل الولدان شیبا، وذلك یوم یكشف عن ساق). ﴿[٨٨] وتری الجبال تحسبها جامدة﴾ لەکاتی نەفخەی یەکەمدا تۆ کێوەکان ئەبینی وا دەزانیت وەستاون و ناجوڵێن و تەکان نادەن و "وەك جاران تابتن" ﴿وهی تمرمرالسحاب﴾ کەچی وەك هەوربەتوندی دێن وئەڕۆن ولەجووڵەدان و لەجێی خۆیان ترازاون وەك دەفەرموێ: (وتسیر الجبال سیرا) واتە: ئەوەندە بە پەلەئەڕۆن تۆ وائەزانی تابتن" ﴿صنع الله الذی اتقن كل شئ﴾ ئەوەش کاری ئەوخوایەیە کە هەموو شتێکی زۆربەرێکوپێکی دروست کردووە ﴿إنه خبیر بما تفعلون﴾ بەڕاستیی ئەوزاتە زۆرئاگایە بەهەرکارێ ئێوە بیکەن چاك وخراپ ﴿[٨٩] من جاء بالحسنة فله خیرمنها﴾ جا ئەوەی کاری چاك بکاو بەوەشەوە بێبۆلامان، ئەوە پاداشی لەوەچاکتروبەرزتریان, بۆ هەیە ﴿وهم من فزع یومئذ آمنون﴾ ولەنارەحەتی و ترسی ئەوڕۆژە ئەمین وپارێزراوو بێ باك ئەبن وەك دەفەرموێ: (لا یحزنهم الفزع الأكبر)٢١/١٠٣. ﴿[٩٠] ومن جاء بالسیئة فكبت وجوهم فی النار﴾ بەلام ئەوکەسەی بە تاوان وکاری خراپ وبەدەوە دێت, ئەوە بە سەرروودا دەخرێنە نێوئاگر ﴿هل تجزون إلا ماكنتم تعملون﴾ پێیان ئەوترێ: ئایا پاداشتان هەر بەپێیکاروکردەوەکانتان نادرێتەوە؟!.

**فەرمان بە پەرستنی خواو بانگەواز بە قورئان:**

لەم ئایەتانەشدا فەرمان دەدات کە تەنها پەروەردگاری کەعبە بپەرستی:﴿[٩١] إنما امرت أن أعبد رب هذه البلدة الذی حرمها﴾ واتە:پێیان بڵێ: بەڕاستیی من تەنها فەرمانی ئەوەم پێکراوە کە هەرپەروەردگاری ئەم شارەیە (مەککە) بپەرستم، کەخوا رێزی لێناوەو, کوشتنیمرۆڤ وگیاندارانی تیا یاساغکردووە،وەك دەفەرموێ: (فلیعبدوا رب هذا البیت الذی أطعمهم...)١٠٦/٣. ﴿وله كل شئ﴾ هەرچی لە بوونەوەردا هەیە هەر هی خوایە, واتە:

هەرچیشتە پەیوەندی بەوەوەهەیەو، هەرئەویش دروستی کردووەو، هەر ئەویش خاوەنیەتی, بێ شەریك بێ وهاوەڵە ﴿وامرت ان اکون من المسلمين﴾ فەرمانم پێکراوە کە لەموسڵمانان بم و تەنهابۆ ئەو ملمکەچ بکەم ﴿[٩٢] وان اتلوا القرآن﴾ فەرمانیشم پێکراوە کە قورئان بخوێنم بەسەرخەڵکداو پێیان رابگەیەنم ﴿فمن اهتدى فإنما يهتدي لنفسه﴾ ئینجا ئەوەی بە قورئان رێنوێن بێ، ئەوە هەر بۆ خۆی رێنوێن ئەبێ و " کەڵك و سوودەکەی بۆ خۆی ئەگەڕێتەوە" ﴿ومن ضل فقل إنما انا من المنذرين﴾ ئەوەش گومڕابوو, پێی بڵێ: من تەنها لە ترسێنەرانم "کارم وەك کاری پێغەمبەرانی ترە، ئیتر کێ بەگوێم ئەکات و، کێیش سەرپێچیم لێ ئەکات، ئارەزووی خۆیەتی, وەك دەفەرموێ: (فإنما عليك البلاغ..). ﴿[٩٣] وقل الحمد لله﴾ ئەی موحەممەد ﷺ بڵێ: تەواوی سوپاس وستایش لەسەر نیعمەتی پێغەمبەرێتی و هیدایەت ﴿سيريكم آياته﴾ لەئایندەیەکی نزیکدا بەڵگەو دەسەڵاتی خۆیتان نیشان ئەدات لە بوونەوەردا، وەك دەفەرموێ:(سنريهم آياتنا فیالآفاق...)٤١/٥٣. ﴿فتعرفونها﴾ جا شارەزایان ئەبن ودەیانناسنەوە ودانیان وپێدا ئەنێن وەك دەفەرموێ:(وفي الأرض آيات للموقنين وفيأنفسكم أفلا تبصرون)٥١/٢٠-٢١. ﴿وما ربك بغافل عما تعملون﴾ بێگومان پەروەردگاری تۆغافڵ و بێئاگا نییە ولەوکاروکردەوەیە ئێوە ئەنجامی دەدەن "ئەگەرچی تۆڵەش دوابخات بۆ ئەوکاتە کەخۆی بۆی دیاریی کردوون". هەزار رەحمەت لە پێشەوا (ئەحمەد) کەسەبارەت بەئاگایی خوا لەم دوو هۆنراوەیەدا دەڵی:

إذا ما خلوتَ الدهرَ يوماً فلا تقل

خلوتُ ولكنْ قلْ عليَ رقيبُ

ولا تحسبن الله يغفل ساعةً

ولا أنَ ما نُخْفِي عليه يغيبُ

لە (١٤١٦/١٢/١)ك بەرامبەر (١٧ / ٤ / ١٩٩٩) لەم سوورەتە بوومەوە لە هەڵەبجە،

لەڕاگەیاندنی بزووتنەوەی ئیسلامیی.

(والحمد لله أولا وآخرا).

*** *** ***

## ٢٨- سوورەتی ( قەسەس )ـە

## مەککەییەو ( ٨٨ ) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشەرو دلۆڤان

سوورەتی(قەسەس)یش وەك هاوڕێنەکانی خۆی, بایەخ وگرنگی بەلایەنی: بیرو باوەڕو، پەیام و, زیندوو بوونەوە دەدا. ئەم سوورەتە وەك راڤەیەك بێ وایە بۆ سوورەتی (شوعەراء، نەمل)، وە تەوەرەکەی بەدەوری بیروباوەڕی هەق و ناهەق دایە، ملکەچ بوون بۆ سوننەتی خوای گەورە، ململانێ لە نێوان سوپایخواو، لەشکری شەیتاندا، داستانی فیرعەونی ستەمکارو ملهوڕ و ریسواکردنی گەلەکەی، موساو هەوڵەکانی لەپێناوی رزگار کردنی گەل و نەتەوەکەیدا، ئەوسا هەواڵ وچیرۆکی قاروونیش دێت.

**سەرگروشتەی مووساو قەومەکەی لەگەڵ فیرعەون:**

﴿**بسم الله الرحمن الرحیم*** [١] **طسم**﴾ ئەم جۆرە پیتانە گەلێ جار باسمان لێوەکردوون، لێرەش واتاکەی هەر ئەوەیە کە: قورئان موعجیزەیەو، هەرلەم جۆرەپیتانەپێکهاتووە، دەفەرموون ئێوەش وێنەی بێنن ﴿[٢] **تلك آیات الکتاب المبین**﴾ ئەم ئایەتانە، گشت ئایەتی قورئانێکی روون و ئاشکرا یە، یان روون کەرەوەی رێبازو رێگایە ﴿[٣] **نتلوا علیك من نبأ موسی وفرعون بالحق**﴾ ئێمە لەوقورئانەدا بەشێك لە داستان وهەواڵی موساو فیرعەونت بەراست و رەوا بۆ ئەخوێنینەوە ﴿**لقوم یؤمنون**﴾ ئەم هەواڵەیش کەڵك بەخش ئەبێ بۆ گەلێك کە ئیمان و بڕوا بێنن و ئامادەبن سوودی لێوەربگرن، وەك ئەفەرموێ: (نحن نقص علیك احسن القصص) ٣/١٢ ﴿[٤] **إن فرعون علا فی الأرض**﴾ بێگومان فیرعەون یاخی بوو ودەعیەی بەسەر وڵات وخەڵکی سەرزەمینی میسردا کرد ﴿**وجعل أهلها شیعا**﴾ وە خەڵکەکەشی لە حەق ترازان و کردیە دەستە دەستەو جودایی دروست کرد لە نێوانیاندا، دەرنجام بوونە چەند گروپ و، هەریەکەشیان لەهەوڵی پووچەڵکردنەوەی فرت و فێڵی ئەویتردا بوو، پاشان فیرعەونیش ئەو تەفرەقەیەی قۆزتەوەو کردنیە خزمەتکاری خۆی! ﴿**یستضعف طائفة منهم**﴾ هەندێکیانی (بەنیئیسرائیل) لاوازو بێهێزو ریسواو زەلیل ئەکرد شەوو ڕۆژ خزمەتی خۆی و قیبتیەکانی پێدەکردن ﴿**یذبح أبناءهم ویستحیی نساءهم**﴾ جگە لەوەش نێرینەو کوڕانیانی سەر ئەبڕی کاتێ کە لەدایك ئەبوون، نەوەك قارەمانێکیان لێهەڵکەوێ و دەسەڵاتەکەی لێ بسێنێ بۆیە خەڵکێکی زۆری کردە چاودێرو هەر ژنێ نێرینەی دەبوو سەری دەبڕی و، ژنانیشی بەزیندوویی ڕادەگرت بۆخزمەتگوزاریی و کارەکەریی ﴿**إنه کان من المفسدین**﴾ بە ڕاستیی ئەو لە تێکدەران وموفسیدان بوو پیشەی هەرتۆقاندن و پیاوکوشتن ولە سێدارەدان بوو. پاش ئەوەی خوای گەورە باسی بەهرەکانی خۆی بەسەر بەنی ئیسرائیلەوە ئەکاو، ئەفەرموێ: ﴿[٥] **ونرید أن نمن علی الذین استضعفوا فی الأرض**﴾ ئێمە ئەمانەوێ بە سەر کزو لاوازانی رووی زەویی (بەنی ئسرائیل) منەت بنێین رزگار یان بکەین لە شاڵاوی فیرعەونی داگیرکەر ئەگەرچی ئەو هەر هەوڵی بنەبڕ کردنی دەدان، هەرئەمەش مەبەستە کەلە سورەتی (١٣٧/٧)دا دەفەرموێ: (وتمت کلمة ربك الحسنی علی بنی إسرائیل) جا لێرەدا باسی ئەوە ناکات هۆی چیبوو سەرەنجام گەلێك کەسی لە بەنی ئیسرائیل کردە پێشەوا؟ هەروەك باسی جۆری میراتەکە ناکات، بەڵام لەسوورەتی (٢٤/٣٢)دا: (وجعلنا منهم أئمة یهدون بأمرنا لماصبروا وکانوا بآیاتنا یوقنون) دەست نیشان کراوە کە: تەنها خۆگرتن و متمانە بەخۆو (صەبر) و (یەقین)ی تەواو بوو بۆونە پێشەوا، دەستکەوت و میراتەکەش لەسوورەتی (١٣٧/٧)دا: (و أورثنا القوم الذین کانوا یستضعفون مشارق الأض ومغاربها..) وە لە (٢٦/٥٧-٥٩) دا: (کم ترکوا

الجزء العشرون — سورة النمل

مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ خَيْرٌ مِّنْهَا وَهُم مِّن فَزَعٍ يَوْمَئِذٍ ءَامِنُونَ ﴿٨٩﴾ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَكُبَّتْ وُجُوهُهُمْ فِى ٱلنَّارِ هَلْ تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٩٠﴾ إِنَّمَآ أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ رَبَّ هَٰذِهِ ٱلْبَلْدَةِ ٱلَّذِى حَرَّمَهَا وَلَهُۥ كُلُّ شَىْءٍ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٩١﴾ وَأَنْ أَتْلُوَا ٱلْقُرْءَانَ فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِى لِنَفْسِهِۦ وَمَن ضَلَّ فَقُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ﴿٩٢﴾ وَقُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ سَيُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ فَتَعْرِفُونَهَا وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٩٣﴾

سُورَةُ القَصَصِ — ترتيبها ٢٨ — آياتها ٨٨

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

طسٓمٓ ﴿١﴾ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴿٢﴾ نَتْلُوا۟ عَلَيْكَ مِن نَّبَإِ مُوسَىٰ وَفِرْعَوْنَ بِٱلْحَقِّ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٣﴾ إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِى ٱلْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا يَسْتَضْعِفُ طَآئِفَةً مِّنْهُمْ يُذَبِّحُ أَبْنَآءَهُمْ وَيَسْتَحْىِۦ نِسَآءَهُمْ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٤﴾ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴿٥﴾

٣٨٥

من جنات وعيون وزروع ومقام كريم ونعمة كانوا فيها فاكهين كذلك وأورثناها قوما آخرين) وە لەسوورەتی (٤٤/٢٥-٢٨)دا: (فأخرجناهم من جنات وعيون وكنوز ومقام كريم كذلك وأورثناها بنى إسرائيل) روون كراوەتەوە. ﴿ونجعلهم أئمة﴾ دەمانەوێت بيانكەينە پێشەوای دين ودونيا، وەك ئەفەرموێ: (وجعلهم ملوكا) ٥/٢٠ م ﴿ونجعلهم الوارثين﴾ وەبيانكەينە ميراتگرانی فيرعەون، ئەو لەناوبەرين و، ئەمان ببنە خاوەنی ولآت وەك ئەفەرموێ: (وتمت كلمة ربك الحسنى على بنى اسرائيل) ١٣٧/٧.﴿٦ ونمكن لهم فى الارض﴾ دەمانەوێ ئەوانە لەوسەرزەويەدا دەسەلآت و حكومەتيان بۆساز بكەين، تا دەسەلآتی ولآتی ميسر بگرنە دەست و بەبەرنامەی خوا حوكم بكەن ﴿و نرى فرعون و هامان و جنودهما منهم ما كانوا يحذرون﴾ وە ئەوەی كە فيرعەون و هامان و لەشكرەكەيان لێی ئەترسان نيشانيان بدەين، بەڵێ.. سەرنجام هەر وايش بوو، وە ئەم ئاڵ و گۆڕەيش كە تۆ دەيبينی ئەمڕۆ ئەوە پاشايە، سبەينێ گەدايە هەرسوننەتێكی نەگۆڕاوی خوايە، وەك دەفەرموێ: (وتلك الآيام نداولها بين الناس)٣/١٤٠. فارس و رۆم چ دەسەلآت وتواناييەكيان هەبوو؟! سەيربكە چۆن تۆزيان بە ئاسمانا رۆيشت، موڵك وسامانيان بە (با) چوو، بە هۆی ستەمی گەلەكەيانەوە، دوای ئەوانيش دەوڵەتێكی ئيسلامی هاتە جێگايان، ئەوانيش ژيان هەرچەندە ژيان، پاشان، عوسمانلی يەكان، دواتر كاتێ لەئيسلامەكەيان خاوبوونەوە ئەوروپا بە سەريانداا زاڵ بوو.

الجزء العشرون — سورة القصص

وَنُمَكِّنَ لَهُمْ فِي ٱلْأَرْضِ وَنُرِيَ فِرْعَوْنَ وَهَـٰمَـٰنَ وَجُنُودَهُمَا
مِنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَحْذَرُونَ ﴿٦﴾ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ
أَنْ أَرْضِعِيهِ ۖ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِى ٱلْيَمِّ وَلَا تَخَافِى
وَلَا تَحْزَنِىٓ ۖ إِنَّا رَآدُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٧﴾
فَٱلْتَقَطَهُۥٓ ءَالُ فِرْعَوْنَ لِيَكُونَ لَهُمْ عَدُوًّا وَحَزَنًا ۗ إِنَّ
فِرْعَوْنَ وَهَـٰمَـٰنَ وَجُنُودَهُمَا كَانُوا۟ خَـٰطِـِٔينَ ﴿٨﴾
وَقَالَتِ ٱمْرَأَتُ فِرْعَوْنَ قُرَّتُ عَيْنٍ لِّى وَلَكَ ۖ لَا تَقْتُلُوهُ عَسَىٰٓ
أَن يَنفَعَنَآ أَوْ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدًا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٩﴾ وَأَصْبَحَ
فُؤَادُ أُمِّ مُوسَىٰ فَـٰرِغًا ۖ إِن كَادَتْ لَتُبْدِى بِهِۦ لَوْلَآ أَن
رَّبَطْنَا عَلَىٰ قَلْبِهَا لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٠﴾ وَقَالَتْ
لِأُخْتِهِۦ قُصِّيهِ ۖ فَبَصُرَتْ بِهِۦ عَن جُنُبٍ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ
﴿١١﴾ ۞ وَحَرَّمْنَا عَلَيْهِ ٱلْمَرَاضِعَ مِن قَبْلُ فَقَالَتْ هَلْ أَدُلُّكُمْ
عَلَىٰٓ أَهْلِ بَيْتٍ يَكْفُلُونَهُۥ لَكُمْ وَهُمْ لَهُۥ نَـٰصِحُونَ ﴿١٢﴾
فَرَدَدْنَـٰهُ إِلَىٰٓ أُمِّهِۦ كَىْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ وَلِتَعْلَمَ
أَنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٣﴾

حزب ٣٩

ولما بلغ — ٣٨٦

**خوا دايكی مووسای تێگەياند چۆن مووسا لابدات:**

ئينجا خوا باسی بەشێك لەبەهرەكانی خۆی بەسەر موساوە دەكات: ﴿٧ واوحينا إلى ام موسى ان ارضعيه﴾ ئێمە خستمانە دڵی دايكی موساوە كە شيری بدا ﴿فإذا خفت عليه فألقيه فى اليم﴾ جا كە لە (مووسا) ترست بوو - فيرعەون و سيخوڕەكانی پێی بزانن - بيخە ناوسندوقێكەوەو و بيهاوێژە ناو دەريای (نيل)ەوە. (ئيبن عەباس) ئەڵێ: ماڵی دايكی موسا لەسەر دەريای (نيل)بوو.﴿ولاتخافى ولاتحزنى﴾ وە نەبترسەو، نەغەميشت بۆیببێ ﴿إنا رادوه إليك﴾ چونكە بەراستيی ئێمە ئەيگێڕينەوە لات و هەرخۆت ئەبيتە دايەنی ﴿وجاعلوه من المرسلين﴾ لە ئاييندەشدا دەيكەين بەيەكێ لەپێغەمبەران ئەينێرين بۆلای ئەو سەركەشە.. بەڵێ ئەويش سندوقێكی هێناو موسای خستە نێو لانكێكی بچوكەوە، جابەموساوە هەڵيدايە ناودەرياكەوە!! ﴿٨ فالتقطه آل فرعون ليكون لهم عدوا وحزنا﴾ ئينجا داروەدستەو بنەماڵە وخێزانی فيرعەون هەڵيان گرتەوە، تاسەرەنجام ببێتە دوژمن ومايەی دڵنيگەرانيی وخەفەت و تياچوونيان، (أضواء البيان) ئەڵێت: پاش هەوڵێكی زۆر بۆم دەركەوت كە (ل)ی (ليكون)، (ل)ی (كی)يە، واتە: بۆ تەعليلە" وە ئايەتی: (وما تشاؤون إلا أن يشاء الله) هەرئەوە دەگەيەنێت، چونكە بەراشكاويی دەيگەيەنێت كە ويست وئيرادەی خوای باڵادەستە بەسەر ويست وئيرادەی بەندەدا، ئەوەتافيرعەون

وبنەماڵەکەی ئەیانەوێ موسابکەنە کوڕیخۆیان و سوودیان پێبگەیەنێت (عسى أن ينفعنا..) کەچی خوای گەورە ویستێکی تری هەیەو، دەیەوێ ڕەگ و ڕیشەی ئەو دام و دەزگایەی پێ دەربێنێ!! تێبینی:شەنقیطی خاوەنی (أضواء البيان) یەکێکە لەوانەی کەنکوولی بوونی (مەجاز) ئەکات لە قورئاندا ﴿إن فرعون وهامان وجنودهما كانوا خاطئين﴾ بێگومان فیرعەون و هامان و لەشکرەکەیان تاوانبارو خەتاکاربوون، خەڵکێکی زۆریان بەکوشتدا بۆئەوەی دەسەڵاتەکەیان نەڕوا، کەچی موسایان لەماڵی خۆیاندا گەورە کردو، دەرنجامیش هەر ئەو ڕیشەی دەرهێنان!. وەك لەسوورەتی (٢٥/٧١)دا: (مما خطيئاتهم أغرقوا فأدخلوا نارا..) هاتووە، وە لەسوورەتی (٣٦/٦٩-٣٧)دا: (ولا طعام إلا من غسلين لا يأكله إلا الخاطئون) هاتووە، وە لە سوورەتی (العلق)دا هاتووە: (ناصية كاذبة خاطئة) وە لەسوورەتی (یوسف)داهاتووە: (إنك كنت من الخطئين) ﴿[٩] و قالت امراة فرعون قرة عين لي ولك﴾ بەڵێ موسا هێنرایە بەردەستی فیرعەون، ئەویش ویستی بیکوژێ، بەڵام خێزانەکەی فیرعەون (خاتوو ئاسیە) نەیهێشت و وتی: ئەم کوڕە مایەی ڕووناکی چاوی من و تۆیە چاو ڕوونیەکە بۆهەردوکمان ﴿لا تقتلوه﴾ مەیکوژن ﴿عسى ان ينفعنا او نتخذه ولدا﴾ بەڵکو لەئاییندەدا سوودیبۆمان هەبێ، وەیان بیکەینە کوڕی خۆمان بەباوی خانەوادەی پاشایەتی ئەوسەردەمە، وە ژنەکەیشی منداڵی نەئەبوو ﴿وهم لا يشعرون﴾ ئەوان هیچ ئاگاشیان لێنەبوو چیدەکەن دەستی قەدەر چۆنەو سەرەنجامیان چی لێدێت بەدەست مووساوە.

**مووسا کەوتەوە دەستی فیرعەون:**

﴿[١٠] واصبح فؤاد أم موسى فارغا﴾ ئەوسا دڵی دایکی موسا هەستی بەبێتاقەتی کردو لە هەمووشتێ خاڵێ بوو جگە لەمووسا بیری هیچ شتێکیلانەمابوو وەك (موجاهیدوئیبن عەبباس) دەڵێن. ﴿إن كادت لتبدى به﴾ بە ڕاستیی لەوانە بوو بیدرکێنێ وبەئاشکرا بڵێ ئەمە کوڕی منە، بەتایبەت ئەوکاتەی کە کەوتەوە دەستی فیرعەون ﴿لولا أن ربطنا على قلبها﴾ ئەگەر ئێمە دڵیمان تابت و قایم نەکردایە ﴿لتكون من المؤمنين﴾ تا لەوانەبێت کە بروایان بەبەڵێنی خوا هەیە، ئەوەی کاتی خۆی (انارادوه اليك)ـی فەرموو﴿[١١] وقالت لأخته قصيه﴾ بەخوشکەکەی موسای وت: سۆراخی بکەو بەدوایدا بڕۆ، دەنگوباس و هەواڵی بزانە بۆم ﴿فبصرت به عن جنب وهم لا يشعرون﴾ جا ئەویش چوو بۆ هەواڵ زانینی، ئینجا زۆر بە ژیرانە ئەڕۆیشت و لە کەنارێکەوە بینی و ئەوان هەستیان نەکرد ﴿[١٢] و حرمنا عليه المراضع من قبل﴾ وە لە پێش ڕەتکردنەوەی بۆلای دایکی، گشت ژنێکمان لەسەر یاساغ کرد، ئەوانیش کەوتنە هەوڵدان بۆی، ئەوجا خوشکەکەی کە زانی بۆ ژنێ دەگەڕێن مەمکی بمژێ ﴿فقالت هل ادلكم على اهل بيت يكفلونه لكم﴾ زۆر بەحەکیمانە وتی: ئایا دەتانەوێ خانەوادەیەکتان پێ بناسێنم کە ئەو منداڵەتان بۆ بەخێو بکات و دەسەبەری بێت؟ ﴿وهم له ناصحون﴾ و خێرخوازو دڵسۆزیش بن بۆی بەڵێ خوشکەکەی چوو بۆلای دایکی موسا و، هەردوو پێکەوە هاتن بۆ ماڵی فیرعەون، دیتی واموسا ئەگریی، ئەویش دای بەدەستی دایکیەوەو، مەمکی خستە دەمیەوەو گرتیی و، ئەوانیش دیارییەکی زۆریان دایەو بە موساوە گەڕایەوە بۆ ماڵ، وەك ئەفەرموێ: ﴿[١٣] فرددناه إلى امه كي تقر عينها و لاتحزن﴾ بەو شێوەیە موسامان گێڕایەوە لایدایکی - دوای ئەو هەموو ژان سزاوئازارەی دیتی - تا چاوی ڕۆشن و دڵی فێنك بێتەوەو خەم نەخوا ﴿ولتعلم ان وعد الله حق﴾ بشزانێ کە بەڵێنی خوا هەق و ڕاستە ﴿ولكن اكثر هم لايعلمون﴾ بەڵام زۆرترینی خەڵك نەیاندەزانی موسا دەگێڕینەوە بۆلای دایکی.

## بە دەستی مووسا پیاوێکی (قیبتی) کوژرا:

بەڵێ.. موسا وردە وردە پلەکانی منداڵیی و، لاویەتی خۆی ئەبرێ و پێدەگا، وەك ئەفەرموێ: ﴿[١٤]ولما بلغ أشده واستوى﴾ کاتێ دوای چەندساڵێك پێگەیشت وتەن و ژیریی تەواو بەهێزبوو و بەخۆداهات ﴿آتيناه حكما وعلما﴾ ژیریی وتێگەیشتن و زانیاریمان پێش پەیامبەرایەتی پێبەخشی ﴿وكذلك نجزى المحسنين﴾ هەر ئابەوشێوەیە پاداشیچاککاران ئەدەینەوە ﴿[١٥]ودخل المدينة على حين غفلة من أهلها﴾ موسالەکاتی خەفڵەتی خەڵکی شاردا خۆی کرد بە نێو شاردا. (ئیبن عەباس) ئەڵێ: ئەودەمە کاتی نیوەڕۆ بوو، خەڵکی هەمووی چوو بوو بۆ ئیسراحەت و حەوانەوە ﴿فوجد فيها رجلين يقتتلان﴾ دیتی دوو پیاو جەنگیانەو لەیەك ئەدەن جوولەکە و قبتیەك ﴿هذا من شيعته وهذا من عدوه﴾ ئەمەیان لە تایەفەو هۆزی پەیرەوانی خۆیبوو (بنی إسرائيل)، ئەویتریشیان لە دەستەی دوژمنانی بوو، لەپیاوانی فیرعەون (قیبتی)یەك بوو ﴿فاستغاثه الذى من شيعته على الذى من عدوه﴾ ئەوەی کەلەهۆزو کۆمەڵی خۆیبوو هانای بۆموسا بردوو داوای یارمەتی لێکرد کە لەدەستی دوژمنەکەی رزگاریبکات ﴿فوكزه موسى﴾ موسا بەپەلە چوو بەهاواریەوەو، بە توندی مشتەکۆڵەیەکی لێدا بەڵکو لێکبنەوە ﴿فقضى عليه﴾ کەچی کەوتە زەویی وکوشتیی ﴿قال هذا من عمل الشيطان﴾ موسا پەشیمان بووەوەو لەبەر خۆیەوە وتی: ئەمە کاری شەیتانە، واتە: ئەورقەیهەلسانم، ئەگەرنا وام لێنەئەدا ﴿إنه عدو مضل مبين﴾ بەراستییئەودوژمنێکی گومڕاکەری ئاشکرایە ﴿[١٦]قال رب إنى ظلمت نفسى فاغفرلى﴾ موساپەشیمان بوویەوەو وتی: پەروەردگاری من! بە راستیی من ستەمم لە خۆمکرد، ساتۆیش لێم ببورە وبمبەخشە ﴿فغفر له﴾ جاخوایش لێی خۆشبوو، چونکە دەست ئەنقەست لێینەدابوو ﴿إنه هو الغفور الرحيم﴾ بەراستیی ئەوخوایە زاتێکی زۆرلێبوردەی میهرەبان ودڵاوایە ﴿[١٧] قال رب بما انعمت على﴾ موسا وتی: ئەی پەروەردگارم! بە حەقی چاکەت لەسەرم موەفەقم بکە ﴿فلن اكون ظهيرا للمجرمين﴾ ئەوساهەرگیز نابمە پشتیوانیکافرو تاوانکاران.

الجزء العشرون — سورة القصص

وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَٱسْتَوَىٰٓ ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٤﴾ وَدَخَلَ ٱلْمَدِينَةَ عَلَىٰ حِينِ غَفْلَةٍ مِّنْ أَهْلِهَا فَوَجَدَ فِيهَا رَجُلَيْنِ يَقْتَتِلَانِ هَٰذَا مِن شِيعَتِهِۦ وَهَٰذَا مِنْ عَدُوِّهِۦ ۖ فَٱسْتَغَٰثَهُ ٱلَّذِى مِن شِيعَتِهِۦ عَلَى ٱلَّذِى مِنْ عَدُوِّهِۦ فَوَكَزَهُۥ مُوسَىٰ فَقَضَىٰ عَلَيْهِ ۖ قَالَ هَٰذَا مِنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ ۖ إِنَّهُۥ عَدُوٌّ مُّضِلٌّ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّى ظَلَمْتُ نَفْسِى فَٱغْفِرْ لِى فَغَفَرَ لَهُۥٓ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٦﴾ قَالَ رَبِّ بِمَآ أَنْعَمْتَ عَلَىَّ فَلَنْ أَكُونَ ظَهِيرًا لِّلْمُجْرِمِينَ ﴿١٧﴾ فَأَصْبَحَ فِى ٱلْمَدِينَةِ خَآئِفًا يَتَرَقَّبُ فَإِذَا ٱلَّذِى ٱسْتَنصَرَهُۥ بِٱلْأَمْسِ يَسْتَصْرِخُهُۥ ۚ قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰٓ إِنَّكَ لَغَوِىٌّ مُّبِينٌ ﴿١٨﴾ فَلَمَّآ أَنْ أَرَادَ أَن يَبْطِشَ بِٱلَّذِى هُوَ عَدُوٌّ لَّهُمَا قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ أَتُرِيدُ أَن تَقْتُلَنِى كَمَا قَتَلْتَ نَفْسًۢا بِٱلْأَمْسِ ۖ إِن تُرِيدُ إِلَّآ أَن تَكُونَ جَبَّارًا فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا تُرِيدُ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلْمُصْلِحِينَ ﴿١٩﴾ وَجَآءَ رَجُلٌ مِّنْ أَقْصَا ٱلْمَدِينَةِ يَسْعَىٰ قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّ ٱلْمَلَأَ يَأْتَمِرُونَ بِكَ لِيَقْتُلُوكَ فَٱخْرُجْ إِنِّى لَكَ مِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ ﴿٢٠﴾ فَخَرَجَ مِنْهَا خَآئِفًا يَتَرَقَّبُ ۖ قَالَ رَبِّ نَجِّنِى مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢١﴾

٣٨٧

## مووسا لەبەر قەتڵەکە ترسی لێنیشت:

﴿[١٨] فأصبح فى المدينة خائفا يترقب﴾ ئەوسا ترس وبیم موسای داگرت لەوشارەدا" کە پیاوەکەی تیاکوشتبوو" دەسووڕایەوەو چاوەڕوانیدەکرد ﴿فإذا الذى استنصره بالأمس﴾ کتوپڕهەرئەو پیاوەی کەدوێنی داوای کۆمەکی لێکرد وموسا فریای کەوت ﴿يستصرخه﴾ دووبارە هاواری بۆ هێناو داوای یارمەتی لێکرد! لەگەڵ قیبتییەکی تردا بەشەڕهاتبوو، جاکاتێ کەموسای چاوکرد، بە دەنگێکی بەرز هاواری لێکرد فریای بکەوێت ﴿قال له

موسی إنك لغوی مبین﴾ موسا چوو بەهاواریەوە وپێیوت: بەراستیی تۆ بەئاشکراپیاوێکی شەرەنگێزو خراپ
ولاڕێیت ﴿[19] فلما ان اراد ان یبطش بالذی هو عدو لهما﴾ ئینجا کاتێ کەموسا ناچاربوو ویستی هێرش بەرێ
بۆئەوەی کەدوژمنی هەردوکیانەو بەری لێبگرێ ﴿قال یاموسی اترید أن تقتلنی کما قتلت نفسا بالأمس﴾ کەچی
(بەنی ئیسرائیل)یەکە وایزانی دەیەوێ ئەوبکوژێ ,بۆیە وتی ئەیمووسا! ئایائەتەوێ منیش بکوژییت هەروەك
دوێنی پیاوێکت کوشت ﴿إن ترید إلا ان تکون جبارا فی الأرض﴾ دیارە هەرئەتەوێ ببیتە دەسەلاتدارو زۆردارو
ستەمکار لە ڕووی زەویدا، کاتێ کابرای قیبتی بیستی قۆزتیەوەو، هەواڵەکەی گەیاندە کۆشکی فیرعەون ﴿وما
ترید ان تکون من المصلحین﴾ وە تۆناتەوێ لە چاکسازان بیت" لەوانەی هەردەم ئیسلاح ئەکەن" ﴿[20] وجاء رجل من
اقصی المدینة یسعی﴾ دوای ماوەیەك پیاوێك لە پەڕگەی
شارەوە بەهەڵەدەوان هات وخۆی گەیاندە موسا ﴿قال یا
موسی إن الملأ یأتمرون بك لیقتلوك﴾ و وتی: موسا!
وشیاربە! بەراستیی پیاوەناودارو
دەسەلاتدارەکانی "فیرعەون" دانیشتوون وقسەدەکەن
بۆکوشتنیتۆ ﴿فاخرج انی لك من الناصحین﴾ دەسا لەشار
دەرچۆ, چوون من لەدڵسۆزانم بۆتۆ, لەگێم بکە.

**مووسا دەگاتە مەدیەن و پەزی دوو کیژە کە ئاو دەدات:**

﴿[21] فخرج منها خائفا یترقب﴾ ئەوجا موسادەست بەجێ
بەترسەوە لە شاردەرچوو، چاوەڕوانیش بوو کە شتێ
ڕوو بدات بۆیە بەنیگەرانیهەر بەولاوبەولای خۆیدا دەیڕوانی
﴿قال رب نجنی من القوم الظالمین﴾ وتی:
پەروەردگاریمن!لەوخەڵکە ستەمکارانە رزگارم کە ﴿[22] و لما
توجه تلقاء مدین﴾ جا کاتێ مووسا شارەکەی بەجێهێشت
و، بەرەو شاری مەدیەن رووی نا، خۆشحاڵ بووو ﴿قال
عسی رب ان یهدینی سواء السبیل﴾ زۆر بەسۆزەوە وتی:
ئومێدەوارم کە پەروەردگارم رێنموونیم بکات بۆ ڕاستە ڕێ.
شیاوی باسە نێوان (میسر) و (مەدیەن) هەشت رۆژە ڕێ بوو و، خواش باشترین چاودێری کرد ﴿[23] ولما ورد ماء
مدین وجد علیه أمة من الناس یسقون﴾ هەر کە موسا گەیشتە شاری (مەدیەن) وچووە سەرئاوەکەی، "ئەوئاوەی کە
مەڕومالات ئاوی لێ ئەخواردەوە" خەڵکێکی دی و ئاژەڵەکانیان ئاودەدەن ﴿ووجدمن دونهم امراتین تذودان﴾
لەنزیکیانەوە دووئافرەتی دی کە پەزەکانیان دوور دەخەنەوە ﴿قال ما خطبکما﴾ پێی وتن: ئیشتان چیە، بۆ
پەزەکانتان ئاو نادەن؟ ﴿قالتا لا نسقی حتی یصدر الرعاء﴾ وتیان: ئێمە مەڕەکانی خۆمان ئاو نادەین تا شوانەکان
مەڕەکانی خۆیان ئاو نەدەن و نەڕۆنە دواوە ئەوجا ئێمەش دێین، چونکە نامانەوێ عەزیەتی خەڵکی بدەن و تێکەڵی
پیاوان ببین ﴿وأبونا شیخ کبیر﴾ باوکیشمان پیرە مەردێکی بەسالاچووەو، تەمەنی گەورەیە، " توانای نییە بۆخۆی
مەڕەکان ئاوبدا، بۆیە ئێمە خۆمان بەناچاریی هاتووینەتە ئەم مەیدانەوە" ئەوە دەنگوباس وهەواڵی ئێمەیە ﴿[24]

الجزء العشرون — سورة القصص

وَلَمَّا تَوَجَّهَ تِلْقَآءَ مَدْيَنَ قَالَ عَسَىٰ رَبِّيٓ أَن يَهْدِيَنِي سَوَآءَ
ٱلسَّبِيلِ ﴿٢٢﴾ وَلَمَّا وَرَدَ مَآءَ مَدْيَنَ وَجَدَ عَلَيْهِ أُمَّةً مِّنَ
ٱلنَّاسِ يَسْقُونَ وَوَجَدَ مِن دُونِهِمُ ٱمْرَأَتَيْنِ تَذُودَانِ
قَالَ مَا خَطْبُكُمَا قَالَتَا لَا نَسْقِي حَتَّىٰ يُصْدِرَ ٱلرِّعَآءُ وَأَبُونَا
شَيْخٌ كَبِيرٌ ﴿٢٣﴾ فَسَقَىٰ لَهُمَا ثُمَّ تَوَلَّىٰٓ إِلَى ٱلظِّلِّ فَقَالَ
رَبِّ إِنِّي لِمَآ أَنزَلْتَ إِلَيَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ ﴿٢٤﴾ فَجَآءَتْهُ إِحْدَىٰهُمَا
تَمْشِي عَلَى ٱسْتِحْيَآءٍ قَالَتْ إِنَّ أَبِي يَدْعُوكَ لِيَجْزِيَكَ
أَجْرَ مَا سَقَيْتَ لَنَا فَلَمَّا جَآءَهُۥ وَقَصَّ عَلَيْهِ ٱلْقَصَصَ قَالَ
لَا تَخَفْ نَجَوْتَ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٥﴾ قَالَتْ إِحْدَىٰهُمَا
يَٰٓأَبَتِ ٱسْتَـْٔجِرْهُ إِنَّ خَيْرَ مَنِ ٱسْتَـْٔجَرْتَ ٱلْقَوِيُّ ٱلْأَمِينُ
﴿٢٦﴾ قَالَ إِنِّيٓ أُرِيدُ أَنْ أُنكِحَكَ إِحْدَى ٱبْنَتَيَّ هَٰتَيْنِ عَلَىٰٓ أَن
تَأْجُرَنِي ثَمَٰنِيَ حِجَجٍ فَإِنْ أَتْمَمْتَ عَشْرًا فَمِنْ عِندِكَ
وَمَآ أُرِيدُ أَنْ أَشُقَّ عَلَيْكَ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ
ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٢٧﴾ قَالَ ذَٰلِكَ بَيْنِي وَبَيْنَكَ أَيَّمَا ٱلْأَجَلَيْنِ
قَضَيْتُ فَلَا عُدْوَٰنَ عَلَيَّ وَٱللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٌ ﴿٢٨﴾

٣٨٨ فلما قضى

﴿فسقالهما ثم تولى إلى الظل﴾ ئینجا مووسا مەردانە ئاوی بۆهەڵێنجان ومەڕەکانی بۆئاودان، پاشان دوور کەوتەوە و چووە بن سێبەری داری بحەسێتەوە، وە زۆریشی برسی بوو ﴿فقالَ رب إني لما انزلت إلى من خير فقير﴾ جا وتی: ئەی پەروەردگاری من! بەڕاستیی من ئاتاجی هەر خێرو چاکەیەکم (ماڵ وسامان و خواردن) کەبۆم بنێری، (عەتا) ئەڵێ: ژنەکان بیستییان چی وت! ﴿[٢٥] فجاءته إحداهما تمشي على استحياء﴾ جادوای تاوێك یەکێ لەو دووانە هات بۆلای موسا کەبە ئەوپەڕی حەیاوشەرمەوە دەڕۆیشت بەڕێدا، پاش گەڕانەوەیان بۆلای باوکیان و، گێڕانەوەی بەسەرهاتەکەیان بۆی، ئەویش بەیەکێکیانی وت: بڕۆ بانگیبکە ئینجا ئەوەیان هات بەدوای موسادا، زۆربەشەرم ئەڕۆیشت، واتە سیفەتی ئەخلاق وداوێن پاکی ونەفس بەرزی پێوە دیاربوو ﴿قالت إن ابى يدعوك ليجزيك اجر ماسقيت لنا﴾ کەگەیشتەلای پێیگوت: بێگومان باوکم بانگت ئەکات و بۆئەوەی پاداش و کرێی ئاودانی مەڕەکان -کە بۆئێمەت ئاودان- بداتەوە ﴿فلما جاءَه وقص عليه القصص﴾ ئینجا کاتێ موسا هاتە لای باوکیان و هەموو بەسەرهاتەکەی خۆی بۆگێڕایەوە ﴿قال لا تخف نجوت من القوم الظالمين﴾ وتی: مەترسە ئیتر تۆ وای لەشارێکی هێمندا و لە گەڵی ستەمکاران فیرعەن وتاقمەکەی رزگارت بووە ﴿[٢٦] قالت إحداهما يا ابت استأجره﴾ یەکێ لەکچەکان وتی: بابە! بە کرێی بگرە بۆ خزمەت و لەوەڕاندنی مەڕەکان ﴿إن خير من استأجرت القوى الأمين﴾ بەڕاستیی چاکترین رەنجبەر کە تۆ بەکرێی بگریت، دەبێ دووسیفەتی تیابێت:

یەکەم: بەهێزو بەتوانا بێت بۆپاراستنی ئاژەڵەکان. دووەم: ئەمین ودەس پاك وجێی باوەڕبێت "خیانەت لە ئەنجامدانی ئیشەکانیدا نەکا. (ئیبن کەسیر) ئەڵێ: باوکیان وتی: چۆن ئەزانی ئەوپیاوە ئەودووسیفەتەی تیایە؟ کچەکە وتی: چاوم لێبوو کە بەتەنها خۆی بەردی سەربیرەکەی لابرد، لەکاتێکا بە دەپیاو لانەئەچوو، کاتێکیش چووم بە دوایا بۆ شارەزاکردنی، لە کاتی گەڕانەوەدا پێشی کەوتم بۆشارەزایی، کەچی وتی: لە پشت سەرمەوە وەرە، هەر کاتێکیش رێگەکەم هەڵەکرد ئاگادارم بکەوە، سەرنجم دا چاوی بەرز نەکردەوە وتەماشای نەکردم ﴿[٢٧] قال إني اريد ان انكحك إحدى ابنتىهاتين﴾ کاتێ کچەکە ئەودووسیفەتەی لێ گێڕایەوە، کەوتە دڵی باوکییەوە کە کچێکیانی لێ مارە بکات، بۆیە وتی: موسا! من دەمەوێ یەکێ لەم دووکچانەمت لێ مارە بکەم ﴿على ان تأجرنى ثمانى حجج﴾ بەو شەرتەی هەشت ساڵ کارم بۆبکەیت و مەڕەکانم بۆ بەخێو بکەیت ﴿فإن اتممت عشرا فمن عندك﴾ خۆ ئەگەر دە ئیش و کارم بۆ بکەیت ئەوە چاکەو پیاوەتی خۆتە، ئەگینا تۆ تەنها هەشت ساڵت لە سەرە ﴿وما اريد ان اشق عليك﴾ وە من نامەوێت زۆرت بۆ بێنم و بارت لەسەرگران بکەم وبتخەمە ناوزەحمەت ﴿ستجدنى إن شاء الله من الصالحين﴾ ئەگەر خوا بیەوێ زوو دەزانی من قسەی خۆم بەجێ دێنم و تۆیش لە چاکانم دەبینیتەوە، چەندە جوانە.. باوك پیاوی باش دیاریی بکات بۆ کچی خۆی، وەك (شوعەیب و عومەری کوری خەتتاب)، وەیان ئافرەتی داناو ژیر، خۆی بکاتە هاوسەری پیاوی موسڵمان و پاك، (عوتبە) ئەڵێ: ئێمە لەلای پێغەمبەردا بووین ﷺ ئەم (طسم)ی خوێندەوە تاگەیشتە داستانەکەی مووساو فەرمووی: (بەڕاستی مووسا هەشت ساڵ- یان دەساڵ- رەنج بەری کرد لەبەر پاراستنی عەورەتی لە (زینا) و، تێرکردنی زکیی! /٨١٧. ﴿[٢٨] قال ذلك بيني و بينك﴾ بۆیە وتی: دەباشە، ئەوە بڕیارێك بێت لەنێوان من و تۆدا هەشت ساڵ شوانی من و، مارەکردنی کچەکەش لەتۆوە ﴿ايما الأجلين قضيت فلا عدوان على﴾ ئەوکاتەیش ئارەزووی خۆمە هەرکامێك لەو دووانە -هەشت ساڵەکە، یان دەساڵ- راپەڕاندو جێبەجێم کرد، نابێ هیچ ستەمێکم لێ بکرێت ﴿والله على ما نقول وكيل﴾ خوای گەورە وەکیل و بەئاگایە بەرامبەر بەوەی کە ئەیڵێین. ڕاڤەکەرانی قورئان سەبارەت بەدیاریکردنی ئەو پیرە گەورەیە قسەیان جیاوازە: ئایا

شوعەیب پەیامبەرە؟ یان کەسێکی دیکەیە؟ بۆ دەست نیشان کردنەکەی زۆربەیان دەڵێن: شوعەیب پەیامبەرە، هەندێکی دیکەیان دەڵێن: برازای شوعەیب بووە، رایەکی‌تر دەڵێت: هیچ پەیوەندییەکی بەوەوە نەبووە. سەیری تەفسیری (ئیبن کەسیر) بکە. (عبدالوهاب النجار)یش ئەڵێت: گەلێ جار ویستوومە بڵێم: ئەو پیرە گەورەیە شوعەیبی پەیامبەرە بەڵام دەترسام لە قیامەتدا یەخەم بگرێ و بمبا بۆ دادگایی لای خوای کارجوان و بڵێ: پەروەردگاری من! لەمە بپرسە بۆچی منی کردە ئەوکەسە کەموسای کردە رەنجبەر و بەکرێی گرت! دیارە خۆمن نەئەوم، وە نە لەکاتی ئەویشدا بووم. (قصص الأنبیاء/ ٢٠٤). ﴿[٢٩] فلما قضی موسی الأجل﴾ جاکاتێ موسا ماوەی دیاریکراوی خۆی راپەڕاندو تەواوی کرد، ئیبن عەبباس دەڵێ: لەباتی هەشت ساڵەکە دەساڵەکەی بۆ تەواوکرد، هەر ناوبراو ئەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((سألت جبريل: أي الأجلين قضی موسی؟ قال: أتمهما واكملهما)) واتە: لە جبریلم پرسی: ئاخۆ مووسا کامیانی لەودووماوەیە بردە سەری؟ وتی: تەواو باشەکەیان! واتە: دەساڵەکە. تەبەریی. ﴿وسار بأهله﴾ ئیتر لەگەڵ ژنەکەیدا مەدیەنیان بەجێ هێشت وڕێگەیان گرتە بەر و ڕۆیی، وشەوێکی زۆرتاریک و باراناوییان ئەوقەبوو، دەرەنجام وەک (ئیبن عەبباس) ئەڵێ ڕێگەکەیان هەڵەکرد ﴿آنس من جانب الطور نارا﴾ لە لای کێوی توردا ئاگر (نور) ێکی چاوکرد ﴿قال لأهله امكثوا إني آنست نارا﴾ بە ژنەکەی خۆی گو: ئێوە لێرە بمێننەوە من ترووسکایی ئاگرێکی شۆڵەدار دەبینم ﴿لعلی آتيكم منها بخبر او جذوة من النار﴾ بەشکو لەلای ئەو ئاگرەوە هەواڵێك لەبارەی ڕێگەکەوە یان سەرە بزووتێکی ئاگرتان بۆبێنم ﴿لعلكم تصطلون﴾ بەڵکو خۆتانی پێگەرم بکەنەوە ﴿[٣٠] فلما اتاها نودی من شاطئ الواد الأيمن فی البقعة المباركة من الشجرة﴾ جا کاتێ موسا هاتە نزیک ئاگرەکەوە، سەیرئەکات ئاگرنی‌یە، بەڵکو (نوور)ێکە، ئەوجا لەلای راستیی گەلییەکەوەو لەشوێنە

پیرۆزەکەدا لەدارەکەوە، لەلایەن پەروەردگارەوە بانگی لێکرا: ﴿أن یاموسی إنی انا الله رب العالمین﴾ ئەی موسا! بەراستیی من هەرخودی خۆم (الله)م، پەروەردگاری هەمووجیهانەکانم، لەسوورەی (نەمل) یشدا ئەم نووروبانگ لێکردنە کەمێ باسکراوە خوا ئەیەوێ موسا ئامادەو تەیار بکات و بینێرێ بۆلای فیرعەون ﴿[٣١] وان الق عصاك﴾ دە دار دەستەکەشت فرێدە ﴿فلما رآها تهتز كأنها جان ولی مدبرا ولم يعقب﴾ هەرکە موسا فرێیدا دیتی کەزۆر بەخێرایی و بەپەلەو تیژ وەک تیرەمارێك دەبزوێ و دەجووڵێ، ئیتر ترساوپشتی لێهەڵکردولای نەکرد بەلایەوە، (سیدقطب) ئەڵێت: موسا کەبەفەرمانی خوا داردەستەکەی فرێدا.. کتوپڕ ئەبێتە ئەوئەژدیها سەرسوڕهێنەرە داروبەرد قوت ئەدات، دیارە ئەمە ڕووداوێکی سەمەرەیەو مووساش پێشتر هیچ ئامادەبوونێکی بۆی نیە، بۆیە ئا بەوشێوەیە وەک سروشتی گشت ئادەمیزادێك هەرشتێکی ئاوها ببینێ دەترسێ. ﴿یاموسی اقبل ولا تخف إنك من

الجزء العشرون　　　سورة القصص

۞ فَلَمَّا قَضَىٰ مُوسَى ٱلۡأَجَلَ وَسَارَ بِأَهۡلِهِۦٓ ءَانَسَ مِن جَانِبِ
ٱلطُّورِ نَارٗاۖ قَالَ لِأَهۡلِهِ ٱمۡكُثُوٓاْ إِنِّيٓ ءَانَسۡتُ نَارٗا لَّعَلِّيٓ ءَاتِيكُم
مِّنۡهَا بِخَبَرٍ أَوۡ جَذۡوَةٖ مِّنَ ٱلنَّارِ لَعَلَّكُمۡ تَصۡطَلُونَ
(٢٩) فَلَمَّآ أَتَىٰهَا نُودِيَ مِن شَٰطِيِٕ ٱلۡوَادِ ٱلۡأَيۡمَنِ فِي ٱلۡبُقۡعَةِ
ٱلۡمُبَٰرَكَةِ مِنَ ٱلشَّجَرَةِ أَن يَٰمُوسَىٰٓ إِنِّيٓ أَنَا ٱللَّهُ رَبُّ
ٱلۡعَٰلَمِينَ (٣٠) وَأَنۡ أَلۡقِ عَصَاكَۖ فَلَمَّا رَءَاهَا تَهۡتَزُّ كَأَنَّهَا
جَآنّٞ وَلَّىٰ مُدۡبِرٗا وَلَمۡ يُعَقِّبۡۚ يَٰمُوسَىٰٓ أَقۡبِلۡ وَلَا تَخَفۡۖ إِنَّكَ
مِنَ ٱلۡأٓمِنِينَ (٣١) ٱسۡلُكۡ يَدَكَ فِي جَيۡبِكَ تَخۡرُجۡ بَيۡضَآءَ مِنۡ
غَيۡرِ سُوٓءٖ وَٱضۡمُمۡ إِلَيۡكَ جَنَاحَكَ مِنَ ٱلرَّهۡبِۖ فَذَٰنِكَ
بُرۡهَٰنَانِ مِن رَّبِّكَ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَمَلَإِيْهِۦٓۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ
قَوۡمٗا فَٰسِقِينَ (٣٢) قَالَ رَبِّ إِنِّي قَتَلۡتُ مِنۡهُمۡ نَفۡسٗا فَأَخَافُ
أَن يَقۡتُلُونِ (٣٣) وَأَخِي هَٰرُونُ هُوَ أَفۡصَحُ مِنِّي لِسَانٗا
فَأَرۡسِلۡهُ مَعِيَ رِدۡءٗا يُصَدِّقُنِيٓۖ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ (٣٤)
قَالَ سَنَشُدُّ عَضُدَكَ بِأَخِيكَ وَنَجۡعَلُ لَكُمَا سُلۡطَٰنٗا فَلَا
يَصِلُونَ إِلَيۡكُمَا بِـَٔايَٰتِنَآۚ أَنتُمَا وَمَنِ ٱتَّبَعَكُمَا ٱلۡغَٰلِبُونَ (٣٥)

٣٨٩

الأمنين﴾ خوا هێوری ئەکاتەوەوبانگی ئەکات: ئەی‌موسا بەرەو رووی من وەرەو مەترسە، چونکە تۆ لەوانەیت کەبێ باکن و هەردەم لە ئەماندان و لەهیچ شتێ ترسیان نیە ﴿[٣٢] اسلك یدك فی جیبك تخرج بیضاء من غیرسوء﴾ دەستیشت بخەرە بن باخەڵتەوە وبیهێنە دەرەوە، ئەوسا دەبینی بەسپیەتی و جوان و بێ هیچ عەیبێك دێتەدەر ﴿واضمم إلیك جناحك من الرهب﴾ خوای گەورە ئەیەوێ ترسەکەی بنیشێتەوە، بۆیە ئەفەرموێ: دەستت بخەرە سەرسنگ وسەردڵت، بۆئەوەی ترسەکەت نەمێنێ وادەرئەکەوێ دەست خستنە سەردڵ لەکاتی ترسدا ئەبێتە مایەی هێور بوونەوە و نەمانی ترس و لەرز وەك ئیبن عەباس ئەڵێ. ﴿فذانك برهانان من ربك﴾ جا ئەو"عەصاو دەستەیە" دوو موعجیزەن لە لایەن پەروەردگارتەوە ﴿إلی فرعون وملإیه﴾ تا ببنە بەڵگەی راستیت، کاتێ ئەرۆیت بۆلای فیرعەون و کۆمەڵانی دەوروبەری ﴿إنهم کانوا قوما فاسقین﴾ چونکە ئەوانە گەلێکی لە سنوور دەرچوو و یاخی بوووەوە.

**هاروونیش بوویە پێغەمبەر و لەگەڵ موسا چوونە لای فیرعەون:**

﴿[٣٣] قال رب إنی قتلت منهم نفسا فأخاف ان یقتلون﴾ موسا وتی: پەروەردگاری من! تۆ ئەفەرموی برۆ بۆلایان و لە هەمان کاتدا خۆیشت چاك ئەزانیت کەمن پیاوێکم لێ کوشتوون بێگومان ئەو رقەیان هەر لەدڵایە ئەترسم بمکوژن، ئیتر نەتوانم پەیامەکەم رابگەیەنم، واتە: با بەتەنیا نەرۆم ﴿[٣٤] واخی هارون هو افصح منی لسانا﴾ هاروونی برام لە من زمان پاراوترە ﴿فارسله معی ردءا یصدقنی﴾ لەگەڵم بنێرە تا ببێ بەکۆمەکم و وتەکانی منیان پێ بسەلمێنێ ﴿إنی اخاف ان یکذبون﴾ چونکە ئەترسم بروام پێ نەکەن و بەدرۆم بخەنەوە ﴿[٣٥] قال سنشد عضدك بأخیك ونجعل لکما سلطانا﴾ خوایش وەڵامی دایەوەو فەرمووی: پشت وبازووی تۆ بەهاروونی برات بەهێز ئەکەین و دەسەڵاتێکتان ئەدەینێ ﴿فلا یصلون إلیکما﴾ ئیتر بەهیچ شێوەیەك دەستیان نەتانگاتێ ﴿بآیاتنا انتما ومن اتبعکما الغالبون﴾ بەئایەتەکانمانەوە برۆن ئێوەو ئەوەی شوێنتان دەکەوێ زاڵ دەبن ﴿[٣٦] فلما جاءهم موسی بآیاتنا بینات﴾ جا کاتێ موسا بەئایەت و بەڵگە روونەکانمانەوە هاتە لای فیرعەون و تاقمەکەی ﴿قالوا ما هذا إلا سحر مفتری﴾ لەباتی ئەوەی ملکەچ بن.. وتیان: ئەمکارە هەرجادوویەکی هەڵبەستراوە و، هیچ شتێکیتر نیە ﴿وما سمعنا بهذا فی آبائنا الأولین﴾ لە باووباپیرە پێشینەکانیشمان شتیوامان نەبیستووە، واتە: یەك خواپەرستیی، ئێستا وا موسا داوای ئەکات ﴿[٣٧] وقال موسی ربی اعلم بمن جاء بالهدی من عنده ومن تکون له عاقبة الدار﴾ موسا وتی: پەروردگارم لە هەمووکەس چاکتر بەحاڵی ئەوکەسە دەزانێت کە لەلای ئەوەوە بە رێنماییەوە هاتووە وەکێ پاشەرۆژی چاکی بۆ دەبێت ﴿إنه لا یفلح الظالمون﴾ بەراستیی ستەمکاران هەرگیز بەختیارنابن.

الجزء العشرون — سورة القصص

فَلَمَّا جَآءَهُم مُّوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَا بَيِّنَٰتٖ قَالُواْ مَا هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ
مُّفۡتَرٗى وَمَا سَمِعۡنَا بِهَٰذَا فِيٓ ءَابَآئِنَا ٱلۡأَوَّلِينَ ٣٦ وَقَالَ
مُوسَىٰ رَبِّيٓ أَعۡلَمُ بِمَن جَآءَ بِٱلۡهُدَىٰ مِنۡ عِندِهِۦ وَمَن تَكُونُ
لَهُۥ عَٰقِبَةُ ٱلدَّارِۖ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ٣٧ وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ
يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَأُ مَا عَلِمۡتُ لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرِي فَأَوۡقِدۡ
لِي يَٰهَٰمَٰنُ عَلَى ٱلطِّينِ فَٱجۡعَل لِّي صَرۡحٗا لَّعَلِّيٓ أَطَّلِعُ إِلَىٰٓ
إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّي لَأَظُنُّهُۥ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ٣٨ وَٱسۡتَكۡبَرَ
هُوَ وَجُنُودُهُۥ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ إِلَيۡنَا
لَا يُرۡجَعُونَ ٣٩ فَأَخَذۡنَٰهُ وَجُنُودَهُۥ فَنَبَذۡنَٰهُمۡ فِي
ٱلۡيَمِّۖ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلظَّٰلِمِينَ ٤٠
وَجَعَلۡنَٰهُمۡ أَئِمَّةٗ يَدۡعُونَ إِلَى ٱلنَّارِۖ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ
لَا يُنصَرُونَ ٤١ وَأَتۡبَعۡنَٰهُمۡ فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا لَعۡنَةٗۖ
وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ هُم مِّنَ ٱلۡمَقۡبُوحِينَ ٤٢ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا
مُوسَى ٱلۡكِتَٰبَ مِنۢ بَعۡدِ مَآ أَهۡلَكۡنَا ٱلۡقُرُونَ ٱلۡأُولَىٰ
بَصَآئِرَ لِلنَّاسِ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٗ لَّعَلَّهُمۡ يَتَذَكَّرُونَ ٤٣

٣٩٠ وَمَا كُنتَ

**فیرعەون تەکەبووری کردو دوچار بوو:**

﴿[٣٨] **وقال فرعون یا أیها الملأ ماعلمت لکم من إله غیری**﴾ فیرعەون سەرکەشانە وتی: ئەی ئەنجومەنی مەملەکەت، موسا داوای یەك خواپەرستیی ئەکات، من بۆ ئێوە کەسێ تر شك نابەم خواتان بێت بێجگە لەخۆم، (ئیبن عەبباس) ئەڵێت: نێوان ئەم و تەشەیتانەیی و، و تەشەیتانییەکەی تری: (انا ربکم الأعلی) ماوەی چل دانەساڵ بوو ﴿**فأوقد لی یا هامان علی الطین فاجعل لی صرحا**﴾ سا هامان! تۆخشتم بۆسوورەوە کەو کۆشکێکی بەرزو بڵندم بۆدروست بکە ﴿**لعلی اطلع إلی إله موسی**﴾ تا بەشکو سەرکەوم و خواکەی موسا ببینم؟! ﴿**وإنی لأظنه من الکاذبین**﴾ وە من بڕوام وایە کەلە درۆزنانە ﴿[٣٩] **واستکبر هو وجنوده فی الأرض بغیر الحق**﴾ فیرعەون خۆیی ولەشکرودەست وپێوەندی هەربەنارەوا لەسەرزەویی (میصر)دا خۆیان بەگەورە دەزانیی و، نکووڵی هەقیان دەکرد ﴿**وظنوا أنهم إلینا لایرجعون**﴾ وگومانیشیان وابوو کەهەرگیز ناگێردرێنەوە بۆلای ئێمە! ﴿[٤٠] **فأخذناه وجنوده فنبذناهم فی الیم**﴾ جا ئێمەش لە تۆڵەی ئەوەدا قارمان لەخۆیی و، لەسوپاکەی گرت و پێچامانەوەو فڕێمان دانە ناو دەریاوەو هەموومان خنکاندن ﴿**فانظر کیف کان عاقبة الظالمین**﴾ دە سەیرکەو ببینە ئاکام و سەرەنجامی ستەمکاران چۆنبوو؟ ﴿[٤١] **وجعلناهم أئمة یدعون إلی النار**﴾ لەبەر لارییان کردیشمانن بەپێشەوایانێ خەڵکیان بانگ دەکرد بۆ ئاگر ﴿**و یوم القیامة لا ینصرون**﴾ و لەرۆژی قیامەتیشدا یارمەتی نادرێن بۆ رزگار بوونیان لەسزا ﴿[٤٢] **وأتبعناهم فی هذه الدنیا لعنة**﴾ هەر لەم دونیایەشدا نەفرینمان بە دوادا ناردن ﴿**ویوم القیامة هم من المقبوحین**﴾ و لەرۆژی قیامەتدا زۆر ئێسك تاڵ و ناشیرینن "دوورن لە میهرەبانیخواوە". لە سورەتی (٩٩/١١)دا ئەفەرموێ: (واتبعوا فی هذه لعنة ویوم القیامة بئس الرفد المرفود).

سُورَةُ القَصَص — الجُزْءُ العِشْرُون

وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ ٱلْغَرْبِيِّ إِذْ قَضَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَى ٱلْأَمْرَ وَمَا كُنتَ
مِنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٤٤﴾ وَلَٰكِنَّآ أَنشَأْنَا قُرُونًا فَتَطَاوَلَ عَلَيْهِمُ
ٱلْعُمُرُ وَمَا كُنتَ ثَاوِيًا فِيٓ أَهْلِ مَدْيَنَ تَتْلُواْ عَلَيْهِمْ
ءَايَٰتِنَا وَلَٰكِنَّا كُنَّا مُرْسِلِينَ ﴿٤٥﴾ وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ
ٱلطُّورِ إِذْ نَادَيْنَا وَلَٰكِن رَّحْمَةً مِّن رَّبِّكَ لِتُنذِرَ قَوْمًا
مَّآ أَتَىٰهُم مِّن نَّذِيرٍ مِّن قَبْلِكَ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٤٦﴾
وَلَوْلَآ أَن تُصِيبَهُم مُّصِيبَةٌۢ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ فَيَقُولُواْ
رَبَّنَا لَوْلَآ أَرْسَلْتَ إِلَيْنَا رَسُولًا فَنَتَّبِعَ ءَايَٰتِكَ وَنَكُونَ
مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٧﴾ فَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلْحَقُّ مِنْ عِندِنَا قَالُواْ
لَوْلَآ أُوتِيَ مِثْلَ مَآ أُوتِيَ مُوسَىٰٓ أَوَلَمْ يَكْفُرُواْ بِمَآ أُوتِيَ
مُوسَىٰ مِن قَبْلُ قَالُواْ سِحْرَانِ تَظَٰهَرَا وَقَالُوٓاْ إِنَّا بِكُلٍّ كَٰفِرُونَ
﴿٤٨﴾ قُلْ فَأْتُواْ بِكِتَٰبٍ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ هُوَ أَهْدَىٰ مِنْهُمَآ أَتَّبِعْهُ
إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٤٩﴾ فَإِن لَّمْ يَسْتَجِيبُواْ لَكَ فَٱعْلَمْ
أَنَّمَا يَتَّبِعُونَ أَهْوَآءَهُمْ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنِ ٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ بِغَيْرِ
هُدًى مِّنَ ٱللَّهِ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِي ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٠﴾

٣٩١

**خوا نیعمەت گەلێکی بەخشی بە موسا:**

﴿[٤٣] **ولقد آتینا موسی الکتاب من بعد ما أهلکنا القرون الأولی**﴾ بێگومان پاش ئەوەی گەلانی رۆژگاری پێشوومان فەوتاند گەلانی (نوح، عاد، سەموود، لوط،..هتد) کتێبی تەوراتمان بەموسا دا ﴿**بصائر للناس**﴾ تا بۆمەردم ببێتە نوورو رووناکیی دڵەکان ﴿**وهدی و رحمة لعلهم یتذکرون**﴾ وە ببێتە رێ نیشاندەروو میهرەبانی بەشکو ئامۆژگاری پێوەرگرن ﴿**وما کنت بجانب الغربی**﴾ ئەی پێغەمبەرﷺ تۆ لەبەشی خۆرئاوای کێوی توردا نەبووی ﴿**إذ قضینا إلی موسی الأمر**﴾ کاتێ کەفرمانی پەیامبەریەتیمان بەموسادا ﴿[٤٤] **وماکنت من الشاهدین**﴾ وە تۆ لە ئامادە بووانیش نەبوویت تا رووداوەکەیان بۆ بگێڕیتەوە ﴿[٤٥] **ولکنا أنشأنا قرونا فتطاول علیهم العمر**﴾ وە بەڵام ئێمە خەڵکانێکی زۆرمان دروست کردن ئینجا تەمەنی زۆریان رابوارد جا پەیمانی خوایان لەبیر کرد ئێمەیش

وەحیی و سروشمان بۆ کردییت کەبێدارو هۆشیاریان بکەیتەوە ﴿وما كنت ثاويا فى اهل مدين تتلوا عليهم آياتنا﴾ وە تۆهیچ کات لەناوخەڵکی شاری مەدیەندا نەبوویت ئایەتەکانی ئێمەیان بەسەرا ئەخوێنیتەوەو تا بڵێن: لەوانەوە هەواڵی موسا وەردەگری و بۆمانی دەگێڕیتەوە ﴿ولكنا كنا مرسلين﴾ وە بەڵام ئێمە پێغەمبەرانمان ناردووە، تۆشمان بۆ ناوخەڵکی مەککە ناردو، ئەو دەنگ و باس و هەواڵانەمان پێدایت بۆیان دەگێڕیتەوە ﴿٤٦ وما كنت بجانب الطور إذ نادينا﴾ وەتۆ ئەی پێغەمبەر ﷺ لەتەنیشتی کێوی توریشدا نەبوویت کاتێ کەموسامان بانگ کردوقسەمان لەگەڵ کرد ﴿ولكن رحمة من ربك﴾ بەڵام ئەمەش هەر میهرەبانیی و بەزەییەك بوو لەلایەن پەروەردگارتەوە کەتۆمان لێ ئاگادار کردی ﴿لتنذر قوما ما اتاهم من نذير من قبلك﴾ تا گەلێك واتە: هۆزە قورەیش بێدار بکەیتەوەو بیانترسێنیت کەلە پێش تۆوە هیچ ترسێنەرێکیان نەهات بوو ﴿لعلهم يتذكرون﴾ بەڵکو بیربکەنەوەو ئامۆژگاریی وەربگرن، مەبەست ماوەی نێوان عیساو موحەممەدە (علیهما الصلاة و السلام)، کە نزیکەی (٦٠٠) ساڵ بوو ﴿٤٧ و لولا ان تصيبهم مصيبة بما قدمت ايديهم﴾ خۆئەگەر لە بەر ئەوە نەبا کە تووشی بەڵاو دەردێك بووبان بەهۆی ئەو کردەوانەی کردوونیان (پێش هاتنی تۆ) ﴿فيقولوا ربنا لولا ارسلت إلينا رسولا﴾ ئەوجا بڵێن پەروەردگاری ئێمە! بۆچی پێش ئەم سزایە پەیامبەرێکت بۆ نەناردین تا ﴿فنتبع آياتك و نكون من المؤمنين﴾ تاپەیرەوی لە ئایەتەکانت بکەین و لەریزی بڕوادارانیشدا بووینایە، واتە: تۆمان ناردە لایان تا بیانوو و هیچ قسەیەکیان نەمێنێ.

**عینادی خوانەناسان:**

﴿٤٨ فلما جاءهم الحق من عندنا﴾ جا کاتێك کەئەم هەق و راستییەیان بۆهات لەلایەن ئێمەوە، واتە: کاتێ پێغەمبەر ﷺ موحەممەدیان بۆ هات بە قورئانەوە ﴿قالوا لولا أوتى مثل ما اوتى موسى﴾ وتیان: بۆچی نەدرا بە ئەو چەشنی ئەوەی درا بە موسا لە موعجیزات ﴿اولم يكفروا بما اوتى موسى من قبل﴾ ئایا ئەوانە لەپێش تۆوە بێبڕوانەبوون بەوەی کەبەموساو(عیسا) درا! ﴿قالوا سحران تظاهرا﴾ وتیشیان: ئەم دوانە -قورئان و تەورات- دوو جادوون پەیدابوون وهەردووپشتگیری یەکتر ئەکەن قورئان ددان ئەنێت بەتەوراتدا، ئەمیش ددان ئەنێت بەودا، ئیترلەراستییەوە زۆردوورن ﴿وقالوا إنا بكل كافرون﴾ وتیشیان ئێمە باوەڕمان بەهیچ کامیان (تەورات) و (قورئان) نیە ﴿٤٩ قل فأتوا بكتاب من عند الله﴾ لە وەڵامیاندا پێیان بڵێ: ئێوە نامەیەکیتر بێجگە لە تەورات و قورئان لەلایەن خواوە بێنن ﴿هو اهدى منهما اتبعه إن كنتم صادقين﴾ کە لە هەردووکیان باشتر رێگەنیشان بدا، ئەوجا منیش پەیرەوی لێدەکەم ئەگەر ڕاست ئەکەن ئەودووانە جادوون ﴿٥٠ فإن لم يستجيبوا لك فاعلم انما يتبعون أهواءهم﴾ خۆئەگەر وەڵامیان نەدایتەوە نەیانتوانی نامەیەکیتر بێنن ئەوە بزانە کە ئەوانە هەر پەیرەوی لە ئارەزووی خۆیان ئەکەن ﴿ومن أضل ممن اتبع هواه بغير هدى من الله﴾ چ کەسێ گومڕاترە لەو کەسەی پەیرەوی هەواو ئارەزووی خۆی کردووە، بێ ئەوەی هیچ رێنوێنێکی لەخواوە هەبێ..؟ ﴿إن الله لا يهدى القوم الظالمين﴾ بەراستیی خواش رێنوێنی گەلی ستەمکاران ناکات ﴿٥١ ولقد وصلنا لهم القول﴾ بەراستیی پەیامی قورئانمان یەك لەدوای یەك پێگەیاندوون هەندێکی لە شوێن هوندێکی ﴿لعلهم يتذكرون﴾ بەشکو بیر بکەنەوەو ئامۆژگاری وەربگرن.

**خاوەن نامەکان لێیان موسڵمان دەبێ:**

﴿٥٢ الذين آتيناهم الكتاب من قبله﴾ ئەو کەسانەی کە لەپێش قورئاندا نامەی (تەورات و ئینجیل)مان پێ بەخشین ﴿هم به يؤمنون﴾ هەیانە باوەڕ بە موحەممەد ﷺ دەێنێت، چونکە لەنامەکانیدا باسی خۆی و ئەم ئایینە تازەیەی هاتووە ﴿٥٣ وإذا يتلى عليهم قالوا آمنا به﴾ هەرکاتێکیش قورئانیان بۆبخوێنرێتەوە خێرا ئەڵێن: بڕوامان

پێهێنا ﴿إنه الحق من ربنا﴾ بەڕاستیی ئەو هەقەیە لەلایەن پەروەردگارمانەوە پێمان ڕاگەیەنراوە ﴿إنا كنا من قبله مسلمين﴾ کە ئێمە پێش ئەویش کەبێتە خواری هەر ملکەچ و موسڵمان بووین ﴿٥٤ اولئك يؤتون اجرهم مرتين بما صبروا﴾ ئا ئەوانە بەهۆی ئارامیی و خۆگرییانەوە دووجار پاداشت دەدرێنەوە ﴿ويدرءون بالحسنة السيئة﴾ وە بە چاکەش بەرهەڵستی کاری خراپە دەکەن ﴿ومما رزقناهم ينفقون﴾ و لەوەیش پێمان بەخشیون، دەبەخشن ﴿٥٥ و إذا سمعوا اللغو أعرضوا عنه﴾ هەرکە قسەی بێهوودە دەبیسن، و ڕووی لێوەر دەگێڕن ﴿و قالوا لنا اعمالنا و لكم اعمالكم﴾ بەنەفامان دەڵێن: کاروکردەوەی خۆمان بۆ خۆمان و، کارو کردەوەی ئێوەیش بۆخۆتان ﴿سلام عليكم لا نبتغي الجاهلين﴾ سڵاوتان لەسەربێت، ئێمە نامانەوێ بە گژ نەزانانا بڕۆین و، ڕاو بۆچوونی ئەوانمان نیە دیارە مەبەست بەم سڵاوە، سڵاوی دوور کەوتنەوەیە لێیان، نەك سڵاوی خۆشەویستیی و نزیکبوونەوە. نزیکەی (۲۰) کەسێ لە گاورەکانی (حەبەشە) هاتنە لای پێغەمبەرو ﷺ پێکەوە لەمزگەوتدا دانیشتن، چ قسەو پرسیارێکیان هەبووکردیان، پاشان بانگی کردن بۆلای ئیسلام و هەندێ قورئانی بۆخوێندنەوە، ئەوجا زۆر گریان، پاشان موسڵمان بوون، جاکاتێ کەهەستان (ئەبووجەهل)یان پێگەیی و، هەندێ قسەی هەڵەو بێجێی لەگەڵ کردن لەخەم و خەفەتی ئەوەکە بڕوایان هێناوە، ئەوانیش وتیان: ((سلام عليكم لانجاهلكم، لنا مانحن عليه ولكم ما انتم عليه)) ئینجا ئایەتی: (الذين آتيناهم الكتاب... لانبتغي الجاهلين) هاتە خوارێ. تەفسیری (ئیبن کەسیر).

**پێغەمبەریش ﷺ بێ ئیزنی خوا ڕێنمایی کەسی پێناکرێت:**

﴿٥٦ إنك لا تهدي من احببت﴾ بێگومان تۆناتوانی ئەی پێغەمبەر ﷺ کەسێ بخەیتە سەر ڕێی ڕاست و بڕوا هێنان کە بۆخۆت خۆشت بوێ هەرچەندە هەوڵ و تەقالای لەگەڵ بدەیت ﴿ولكن الله يهدي من يشاء﴾ بەڵام خوا ڕێنمایی هەرکەسێ خۆی بیەوێ دەکا ﴿و هو اعلم بالمهتدين﴾ خۆیشی زاناترە بەوانە کە ڕێبازی هیدایەت دەگرن، ئەوخۆی ئەزانێ کێ شایستەی هیدایەتەو ئامادەیی تێدایە. ئەم ڕاستیە لە گەلێ ئایەتدا ڕوون کراوەتەوە، لەوانە: فەرمایشتی (إن تحرص على هداهم فإن الله لا يهدي من يضل..) وە فەرمایشتی: (ومن يرد الله فتنته فلن تملك له من الله شيئا أولئك الذين لم يرد الله أن يطهر قلوبهم..) ئیمامی (بوخاری) و (موسلیم) یش ئەڵێن: ئەم ئایەتە سەبارەت بە (ئەبو تالیب) هاتووە، ئەوەبوو پەیامبەر ﷺ زۆر داوای لێکرد بڕوا بێنێ و، هەوڵێکی زۆریشی لەگەڵدا، بەڵام بێ کەڵك بوو و هەر بڕوای نەهێنا! جا خوای گەورەیش ئەو ئایەتەی بەگوێی پەیامبەرا دا ﷺ. ﴿٥٧ و قالوا إن نتبع الهدى معك نتخطف من ارضنا﴾ بت پەرستەکانی مەککە وتیان: ئەگەر پەیڕەوی لە دینەکەی تۆ بکەین ئەوا لەسەرئەم زەویی و ناوچەی خۆمانەدا دەرفێنرێین ﴿او لم نمكن لهم حرما آمنا﴾ ئەدی ئێمە ئەوانمان لە حەرەمێکی هێمن و ئارامدا جێ

الجزء العشرون — سورة القصص

الحزب ٤٠

۞ وَلَقَدْ وَصَّلْنَا لَهُمُ الْقَوْلَ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٥١﴾ الَّذِينَ
آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ مِن قَبْلِهِ هُم بِهِ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٢﴾ وَإِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ
قَالُوا آمَنَّا بِهِ إِنَّهُ الْحَقُّ مِن رَّبِّنَا إِنَّا كُنَّا مِن قَبْلِهِ مُسْلِمِينَ ﴿٥٣﴾
أُولَٰئِكَ يُؤْتَوْنَ أَجْرَهُم مَّرَّتَيْنِ بِمَا صَبَرُوا وَيَدْرَءُونَ بِالْحَسَنَةِ
السَّيِّئَةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٥٤﴾ وَإِذَا سَمِعُوا اللَّغْوَ
أَعْرَضُوا عَنْهُ وَقَالُوا لَنَا أَعْمَالُنَا وَلَكُمْ أَعْمَالُكُمْ سَلَامٌ عَلَيْكُمْ
لَا نَبْتَغِي الْجَاهِلِينَ ﴿٥٥﴾ إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ
اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ ﴿٥٦﴾ وَقَالُوا إِن
نَّتَّبِعِ الْهُدَىٰ مَعَكَ نُتَخَطَّفْ مِنْ أَرْضِنَا أَوَلَمْ نُمَكِّن لَّهُمْ
حَرَمًا آمِنًا يُجْبَىٰ إِلَيْهِ ثَمَرَاتُ كُلِّ شَيْءٍ رِّزْقًا مِّن لَّدُنَّا وَلَٰكِنَّ
أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٧﴾ وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَرْيَةٍ
بَطِرَتْ مَعِيشَتَهَا فَتِلْكَ مَسَاكِنُهُمْ لَمْ تُسْكَن مِّن بَعْدِهِمْ
إِلَّا قَلِيلًا وَكُنَّا نَحْنُ الْوَارِثِينَ ﴿٥٨﴾ وَمَا كَانَ رَبُّكَ مُهْلِكَ
الْقُرَىٰ حَتَّىٰ يَبْعَثَ فِي أُمِّهَا رَسُولًا يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِنَا وَمَا
كُنَّا مُهْلِكِي الْقُرَىٰ إِلَّا وَأَهْلُهَا ظَالِمُونَ ﴿٥٩﴾

نەکردۆتەوە لەم کاتی بێ بڕواییەیاندا ئیدی ئەگەر شوێن ئاینی موحەممەدﷺ بکەون چۆن دەفڕێنرێن ﴿یجبی إلیه ثمرات کل شئ رزقا من لدنا﴾ جۆرەها بەرووبوومی بۆ کۆ ئەکرێتەوەو بۆی ئەهێنرێ، ئەوە هەمویشی رزق و رۆزییە لەلایەن ئێمەوە لەو جێگا بێ دەرامەتەدا بۆیان دێت ﴿ولکن أکثرهم لا یعلمون﴾ بەڵام زۆربەیان ئەم راستییە نازانن.

**پاش هاتنی پێغەمبەرانیش گوند گەلێك بە قڕ چوون:**

﴿[٥٨] وکم اهلکنا من قریة بطرت معیشتها﴾ ئەمانە پەند وەرناگرن لەچارەنووسی گەلانیتر، ئەگەرنا شارو ئاواییەکی زۆرمان لەناوبرد، کە لەبەر زۆری رزق و رۆزیی مەست و سەرخۆش ببوون ﴿فتلك مساکنهم لم تسکن من بعدهم إلا قلیلا﴾ ئەمەش خانوو بەرەکانیانە بە وێرانی ماوەتەوە لەدوای تیاچوونیشیان کاتێکی کەم نەبێ کەسی لەوێ نیشتەجێ نەبووە ﴿وکنا نحن الوارثین﴾ هەر ئێمە خۆمان بووینە میراتگریان چونکە کەسیان نەما ﴿[٥٩] و ما کان ربك مهلك القری﴾ پەروەردگاری تۆ بە ناهەق شارو گوندەکانی وێران نەکردوون ﴿حتی یبعث فی أمها رسولا یتلوا علیهم آیاتنا﴾ هەتا لەگەورە دێیەکەیاندا پەیامبەرێکی دەنارد، ئایەتەکانی ئێمەیان بەسەرا بخوێنێتەوە ﴿وما کنا مهلکی القری إلا وأهلها ظالمون﴾ هەرگیز ئێمە بەناهەق ئاواییەکانمان کاول نەکردوون، مەگەر خەڵکەکەی دەستیان دابێتە ستەمکار یی، واتە: مەگەر کاتێ پەیامبەرانمان بۆناردبن و بەگوێیان نەکردبن.

**دنیا ویستان و دۆستانی قیامەت:**

﴿[٦٠] وما اوتیتم من شئ فمتاع الحیاة الدنیا وزینتها﴾ وە هەر شتێکتان پێ بەخشراوە لە ماڵ و ژن ومنداڵ و کاڵاو خۆشیی و جوانیی ژیانی ئەم دونیایەیەو دەڕوا (وما عندالله خیر وأبقی) وە ئەوەی لای خوایە چاکترو ماوەدارترە بۆتان ﴿افلا تعقلون﴾ دە ئایا لەوەش تێناگەن و ژیرنابن؟! ﴿[٦١] افمن وعدناه وعدا حسنا فهو لاقیه﴾ ئایا ئەوکەسەی بەڵێنێکی چاکمان پێداوە، ئەو کەسە پێیشی دەگات، وەك بەهەشت و رۆزیی نەبڕاوە ﴿کمن متعناه متاع الحیاة الدنیا﴾ وەکو کەسێکە کە بەکاڵای ژیانی دنیا بەهرەمەندمان کردووە ﴿ثم هو یوم القیامة من المحضرین﴾ لەپاشا ئەوکەسە لەرۆژی قیامەتدا لە ئامادەکراوان دەبێت بۆ سزاو تۆڵەو ئەشکەنجە ﴿[٦٢] و یوم ینادیهم فیقول این شرکاءی الذین کنتم تزعمون﴾ باسی حاڵی هاوبەش دانەرەکانیش بکە، ئەو رۆژە خوا بانگیان لێ ئەکات و ئەفەرموێ: لە کوێن ئەوبت و خوایانەتان کە پێتان وابوو شەریك و هاوبەشی منن؟ ﴿[٦٣] قال الذین حق علیهم القول﴾ جا لەوەڵامدا ئەوانەی کە بڕیارو فەرمانی سزا لەبارەیانەوە دەرچووە، واتە: (سەرۆکەکان) بە خەجاڵەتییەکەوە ئەڵێن: ﴿ربنا هؤلاء الذین اغوینا﴾ ئەی پەروەردگاری ئێمە! ئەمانەهەر ئەوکەسانەن کە ئێمە گوومڕامان کردن ﴿اغویناهم کما غوینا﴾ گومڕامان کردن وەك ئەوەی خۆمان گومڕا بوو بین، واتە: تەنها بە وەسوەسەو قسە بۆ دانان و رازاندنەوەی دونیا

الجزء العشرون — سورة القصص

وَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَىْءٍ فَمَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتُهَا ۚ وَمَا عِندَ
ٱللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٦٠﴾ أَفَمَن وَعَدْنَٰهُ وَعْدًا حَسَنًا
فَهُوَ لَٰقِيهِ كَمَن مَّتَّعْنَٰهُ مَتَٰعَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ثُمَّ هُوَ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ
مِنَ ٱلْمُحْضَرِينَ ﴿٦١﴾ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَآءِىَ ٱلَّذِينَ
كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴿٦٢﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ حَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلْقَوْلُ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ
ٱلَّذِينَ أَغْوَيْنَآ أَغْوَيْنَٰهُمْ كَمَا غَوَيْنَا ۖ تَبَرَّأْنَآ إِلَيْكَ ۖ مَا كَانُوٓا۟ إِيَّانَا
يَعْبُدُونَ ﴿٦٣﴾ وَقِيلَ ٱدْعُوا۟ شُرَكَآءَكُمْ فَدَعَوْهُمْ فَلَمْ يَسْتَجِيبُوا۟
لَهُمْ وَرَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ۚ لَوْ أَنَّهُمْ كَانُوا۟ يَهْتَدُونَ ﴿٦٤﴾ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ
فَيَقُولُ مَاذَآ أَجَبْتُمُ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٦٥﴾ فَعَمِيَتْ عَلَيْهِمُ ٱلْأَنۢبَآءُ
يَوْمَئِذٍ فَهُمْ لَا يَتَسَآءَلُونَ ﴿٦٦﴾ فَأَمَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ
صَٰلِحًا فَعَسَىٰٓ أَن يَكُونَ مِنَ ٱلْمُفْلِحِينَ ﴿٦٧﴾ وَرَبُّكَ
يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ وَيَخْتَارُ ۗ مَا كَانَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ ۚ سُبْحَٰنَ
ٱللَّهِ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٨﴾ وَرَبُّكَ يَعْلَمُ مَا تُكِنُّ
صُدُورُهُمْ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴿٦٩﴾ وَهُوَ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ لَهُ
ٱلْحَمْدُ فِى ٱلْأُولَىٰ وَٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَلَهُ ٱلْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٧٠﴾

٣٩٣

گومڕامان کردن نەك بە زۆرو زۆرکاریی ﴿تبر انا إليك ما كانوا إيانا يعبدون﴾ خوایا! وا ئێمە خۆمان بەری کرد لێیان، ئەوان ئێمەیان نەپەرستووە، بەڵکو دوای هەواو ئارەزووی خۆیان کەوتوون ﴿[64] و قيل ادعوا شركاءكم﴾ ئەوسا بە بێبڕواکان ئەوترێ: ئادەی خواکانتان کە بەهاوبەشی خواتان دانابوون بانگ بکەن ﴿فدعوهم فلم يستجيبوا لهم﴾ ئەوانیش وا دەزانن بە بانگیانەوە دێن، بەڵام وەڵامیان نادەنەوە ﴿و رأوا العذاب لو انهم كانوا يهتدون﴾ ئەو کاتە سزای دۆزەخ دەبینن ئاوات ئەخوازن کە بە ڕێگەی ڕاستدا بڕۆشتنایەو ڕێنوێن بووبان ﴿[65] و يوم يناديهم فيقول ماذا اجبتم المرسلين﴾ و ئەو ڕۆژە بەیاد بکە خوا بانگیان ئەکا پێیان ئەفەرموێ: چیتان وەڵامی پەیامبەرەکان دایەوە؟ ﴿[66] فعميت عليهم الأنباء يومئذ﴾ ئینجا لەو ڕۆژەدا هەواڵەکانیان لێ ون دەبن ﴿فهم لا يتساءلون﴾ ئیتر لەتاو سزادا ناتوانن لە یەکتریش بپرسن بۆیە هەریەکە بۆخۆی دەڵێت: ئای ئەمە چ ڕۆژێکە، بۆچی وامان بەسەرهات؟ ﴿فأما من تاب وآمن وعمل صالحا﴾ بەڵام ئەوکەسەی کەلە شیرك و کاری بەدوخراپ پەشیمان بووەوەوبڕوای هێناو کاری چاکی کرد ﴿فعسى أن يكون من المفلحين﴾ بێگومان ئەو جۆرەکەسانەلە بەختیاران ئەبن، (شێخی ئالووسی) دەڵێ: (و ((عسى)) للتحقيق على عادة الكرام، أوللترجي من قبل التائب المذكور بمعنى: فليتوقع أن يفلح). (ئیبن کەسیر) و (ئەبوعەبدوڵلای قورتوبی)یش دەڵێن: (و ((عسى)) من الله واجبة).

## خوا بیەوێ هەر شتێ بکا، دەیکات:

خوا لەم چەند ئایەتەدا دەسەڵات و باڵادەستی خۆی دەخاتە ڕووو دەفەرموێ: ﴿[68] وربك يخلق ما يشاء ويختار﴾ وەهەر بۆ خواوەندی تۆیە کە هەرچی بوێ دروستیکاو، هەرکەسێکیشی بوێ هەڵیبژێرێ. ئەوان پێیان وابوو کە کەسێکی شیاوتر بەدەر لەپێغەمبەر بۆ هەڵگرتنیپەیامەکەی خوا هەیە ، ئینجا خواش فەرمووی هەڵبژاردن و دیاریکردنی پێغەمبەران هەر بەدەستی خۆیەتی ﴿ما كان لهم الخيرة﴾ بەڵام ئەوان لە بەرامبەر ویستی خواوە هەڵبژاردنیان بۆ نیە، بەڵکو هەڵبژاردن هەر بۆ خوایە ﴿سبحان الله وتعالى عما يشركون﴾ پاکەخوا، بڵندە، لەوشتەی کە ئەوانە ئەیکەنە هاوبەشی ﴿[69] وربك يعلم ماتكن صدورهم وما يعلنون﴾ نە هەر ئەوەندە کە هەڵبژاردن هەر بۆ خوایە..بەڵکوهەر پەروەردگاری تۆ چاك دەزانێ کە ئەو خەڵکە چیلەنێو سینگ و دڵیاندا ئەشارنە وەو، چیش دەر دەخەن و ئاشکرای ئەکەن لەو هەموو توانج و پلارانەی کە ئەیگرنە کەسایەتی پەیامبەر ﷺ ﴿[70] وهوالله لا إله إلا هو﴾ هەر ئەو زاتەیە خودا، جگەلەخۆی هیچ پەرستراوێکیهەق نیە ﴿له الحمدفيالأولى والآخرة﴾ سوپاس و ستایش هەرشایستەی ئەوە لە دنیاو لە ئاخیرەتدا ﴿وله الحكم﴾ حوکم و فەرمانڕەواییش وبڕیار هەر بۆ ئەوە، نەك بۆ کەسێکی تر ﴿واليه ترجعون﴾ وە هەر بۆ لای ئەویش دەبرێنەوە، جا ئەوساش ئیتر هەمووکەس پاداشت وتۆڵەیخۆی وەرئەگرێ.

## شەوگارو ڕۆژگار بەڵگەی تاك و تەنیایی خوان:

﴿[71] قل ارايتم إن جعل الله عليكم الليل سرمدا إلى يوم القيامة﴾ بڵێ: ئادەی وەرن پێم بڵێن: ئەگەرخوا شەوتان لەسەر بکا بەهەمیشەیی تارۆژی قیامەت وهەر ڕۆژنە بێتەوە ﴿من إله غير الله يأتيكم بضياء﴾ بێجگە لە خوا، کێی ترهەیە بتوانێ ڕووناکیتان بۆ بێنێ؟! ﴿افلا تسمعون﴾ دەئایا ئێوە هەق نابیسن و وەریگرن؟ ﴿[72] قل ارايتم إن جعل الله عليكم النهار سرمدا إلى يوم القيامة﴾ پێیان بڵێ: خەڵکینە! ئەگەر خوا ڕۆژگاری کردە هەمیشەیی لەسەرتان وتا ڕۆژی قیامەت درێژەی پێدا ﴿من إله غير الله يأتيكم بليل تسكنون فيه﴾ بێجگە لەخوا، خوایەکی تر هەیە، بتوانێ شەوگارتان بۆ پێش بێنێ! تا بحەوێنەوەو ئاسوودە بن تیایا؟" ﴿افلا تبصرون﴾ دەئایا هەڵەی خۆتان نابینن

لەپەرەستنی غەیری خودا؟! ﴿٧٣ ومن رحمته جعل لكم اللیل والنهار﴾ بێگومان هەركامێكیان نەبڕێتەوە و
درێژەبكێشێ ، ئێوە تووشی زیان ئەبن، بەڵام لەڕەحمەت و میهرەبانی خوایە كەشەوو ڕۆژی بۆداناون و،یەك لەدوای
یەك دێن و دەڕۆن ﴿لتسكنوا فیه﴾ تالەشەودا بحەوێنەوە و بەئاسوودە دانیشن و، لەو ژان وئازارە ڕزگاربن
كەبەڕۆژا تووشتان دەبێت ﴿ولتبتغوا من فضله﴾ بۆئەوەی كە لەڕۆژدا بژێویو، رزق و ڕۆزی وەدەست بێنن ،بۆیە
شەوی بەتاریك دروست كردووە، ڕۆژیش بە ڕووناك ﴿ولعلكم تشكرون﴾ بەشكوشوكرانەشم بكەن ﴿٧٤ ویوم ینادیهم
فیقول این شركائی الذین كنتم تزعمون﴾ بیری ئەو ڕۆژە بكەوە كە خوا بانگیان ئەكات و پێیان ئەفەرموێ: ئەوە
كوان ئەو خوایانەی كە گومانتان وابوو هاوبەشی منبن؟!. دیارە هیچ وەڵامیان نابێت، ئینجا خوای گەورە ئەفەرموێ:

سُورَةُ القَصَص　　الجزء العشرون

قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمُ ٱلَّيْلَ سَرْمَدًا إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ
مَنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِضِيَآءٍ أَفَلَا تَسْمَعُونَ ﴿٧١﴾
قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمُ ٱلنَّهَارَ سَرْمَدًا إِلَىٰ
يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ مَنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِلَيْلٍ تَسْكُنُونَ
فِيهِ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٧٢﴾ وَمِن رَّحْمَتِهِۦ جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ
وَٱلنَّهَارَ لِتَسْكُنُوا۟ فِيهِ وَلِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ
﴿٧٣﴾ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَآءِىَ ٱلَّذِينَ كُنتُمْ
تَزْعُمُونَ ﴿٧٤﴾ وَنَزَعْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا فَقُلْنَا
هَاتُوا۟ بُرْهَٰنَكُمْ فَعَلِمُوٓا۟ أَنَّ ٱلْحَقَّ لِلَّهِ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟
يَفْتَرُونَ ﴿٧٥﴾ ۞ إِنَّ قَٰرُونَ كَانَ مِن قَوْمِ مُوسَىٰ فَبَغَىٰ
عَلَيْهِمْ وَءَاتَيْنَٰهُ مِنَ ٱلْكُنُوزِ مَآ إِنَّ مَفَاتِحَهُۥ لَتَنُوٓأُ بِٱلْعُصْبَةِ
أُو۟لِى ٱلْقُوَّةِ إِذْ قَالَ لَهُۥ قَوْمُهُۥ لَا تَفْرَحْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْفَرِحِينَ
﴿٧٦﴾ وَٱبْتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ وَلَا تَنسَ
نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنْيَا وَأَحْسِن كَمَآ أَحْسَنَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ
وَلَا تَبْغِ ٱلْفَسَادَ فِى ٱلْأَرْضِ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٧٧﴾

قَالَ إِنَّمَا　　٣٩٤

﴿٧٥ ونزعنا من كل امة شهیدا﴾ ئێمە لەوڕۆژەدا لەهەر
ئوممەتێك شایەتێك "پەیامبەرێك" دێنین" شایەتییان لەسەر
ئەدات" ﴿فقلنا هاتوا برهانكم﴾ دوای شایەتیەكە.. پێیان
ئەڵێن: ئادەی بەڵگەی خۆتان بێنن لەسەر ئەوە" كە
ئەتانوت: خوا هاوەڵی هەیە" ﴿فعلموا أن الحق لله﴾ ئینجا
ئەو ڕۆژە بەچاكی ئەزانن كە هەق بە خودایەو، هیچ شەریكە
نیە ﴿وضل عنهم ماكانوا یفترون﴾ وەئەو درۆو كارەناڕەوانە
كەهەڵیان دەبەست بۆ خوا، لێیان بزر دەبێت.

### قارون یاخیی بوو و دۆڕاندی:

ئینجا خوا داستانی قارون دێنێت بۆئەوانەی كەبەهۆی
ماڵ وسامان ودارایییەوە لەسنوور دەرئەچن و، ئەفەرموێ:
﴿٧٦ إن قارون كان من قوم موسی﴾ بەڕاستیی قارون لەگەڵ
و خوێشانی موسا بوو زۆرێك لەزانایان دەڵێن: ئامۆزای
بووە ﴿فبغی علیهم﴾ جا شوڵی لێهەڵكێشان بەهۆی ماڵ و
سامان و دارایییەكەوە پێی درابووخۆی گیڤ كردەوەو خۆی
لێگۆڕا بەرامبەریان ﴿وآتیناه من الكنوز ما إن مفاتحه لتنوء
بالعصبة أولی القوة﴾ ئەوەندە گەنجینەو سامانمان پێدابوو
كەهەڵگرتنی كلیلەكانی قاسەكەی كۆمەڵێكی زۆربەهێزی شەكەت دەكرد ﴿إذ قال له قومه لاتفرح﴾ ئەوەبوو خۆی
دەرخست و بەشتێكی سەمەرەش خۆی هاتە پێش چاو، كاتێ هەندێ لەخزمانی خۆی پێیان وت: ئەم خۆشیی و
شادییە تێكەڵی دەعیەو فیز مەكەو هەق پێشێل مەكە ﴿إن الله لا یحب الفرحین﴾ چونكە خوا پیاوانی دەعیە بازیی
خۆش ناوێ ﴿٧٧ و ابتغ فیما آتاك الله الدار الآخرة﴾ لەخوا بترسە.. هەوڵ بدە لەو ماڵ و دارایییەی كە خوا پێی
بەخشیویت ئەودونیای خۆت ڕۆژی دوایی پێ بەدەست بێنە ﴿ولا تنس نصیبك من الدنیا﴾ بەش و بارەی حەڵاڵی
خۆیشت لەم دونیایە لەبیرمەكە "واتە: بەشی خۆت لە حەڵاڵ و زەڵاڵ رابوێرە" (عەبدوڵای كوڕی عومەر) چەند جوان
ئەڵێ: ئەوەندە هەوڵ بۆ دونیا بدە، وابزانە هەردەمێنیت و نامریت، وایش تێ بكۆشە بۆ ئەو دونیات وابزانە
سبەینێ دەمریت ﴿واحسن كما احسن الله إلیك﴾ خوای گەورە چاكەی لەگەڵ تۆ كردوە، دەسا تۆش لەگەڵ خەڵكدا

چاكه خواز به، واته: لەوسامان و داراییه كەخوای گەوره پێیداویت چاكه بكه ﴿ولاتبغ الفساد في الارض﴾ وه لەم سەر زەوییەدا مەكەوه شوێنی فەسادو كاری بەدفەڕیی ﴿إن الله لا يحب المفسدين﴾ چونكه خوا خراپكارانی خۆش ناوێت ﴿٧٨ قال إنما أوتيته على علم عندي﴾ كەچی دوای ئەو ئامۆژگارییه، قارون وتی: ئەومالٌ و سامانه كەمن هەمه، هەمووی به هۆی زانیاریی و زانستیی خۆمەوه پێم دراوه، واته: من هەرخۆم شایستەی ئەوەم ﴿أو لم يعلم أن الله قد أهلك من قبله من القرون﴾ باشه وا ئەو قسانه ئەكات مەگەر نەیزانیوه كەخوا پێش ئەو خەڵكێكی زۆری لەناوبردووه ﴿من هو أشد منه قوة وأكثر جمعا﴾ كه لەوزۆر بەهێزترو زاناترو سامان زۆرتر بوون؟ دیاره پاشەڕۆژی ئەویش هەردەبێ وەك ئەوان بێ ﴿ولا يسأل عن ذنوبهم المجرمون﴾ لەرۆژی قیامەتدا خوا پرسیار له گوناهەكانی تاوانبارەكان ناكا بۆ زانینی خۆی، چونكه خوا زانست و عیلمی بەگوناهەكانیان هەیه وه دەست بەجێ دەیانخاته ئاگرەوه ﴿٧٩ فخرج على قومه في زينته﴾ ئینجا رۆژێكی قارون خۆی سازداو لەوپەڕی تەنتەنەو جوانیی و رازاوەییدا دەرچوو بۆ ناو هۆزەكەی ﴿قال الذين يريدون الحياة الدنيا﴾ ئەوانەی كه تەنها ژیانی دونیایان دەویست وتیان: ﴿يا ليت لنا مثل ما أوتي قارون﴾ ئەی خۆزگه! ئێمەش ئەوەندەی قاروون سامان ودەسەڵاتمان پێدرابا ﴿إنه لذو حظ عظيم﴾ بەڕاستیی ئەو بەختێكی گەورەی هەیه لەساماندا ﴿٨٠ و قال الذين أوتوا العلم﴾ ئەوه قسەی نەفامەكان بوو! بەڵام ئەوانەیان كه زانستیان لەلایەن خواوه پێدرا بوو، واته: (زاناكانیان) وتیان: ﴿ويلكم ثواب الله خير لمن آمن و عمل صالحا﴾ واز لەوقسانه بێنن.. هاوارو وای بۆئێوه ئەوه چی ئەڵێن؟ پاداشتی خوا زۆر چاكتره بۆئەوكەسەی كه بڕوای دامەزراوی هێناوەوكاری چاكی ئەنجام داوه تا ئەو وەزعەی قارونه ﴿ولا يلقاها إلا الصابرون﴾ بەڵام ئارامگران نەبن، ئەوپاداشه دەستی كەسی تر ناكەوێ.

الجزء العشرون | سورة القصص

قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلۡمٍ عِندِيٓۚ أَوَلَمۡ يَعۡلَمۡ أَنَّ ٱللَّهَ قَدۡ أَهۡلَكَ
مِن قَبۡلِهِۦ مِنَ ٱلۡقُرُونِ مَنۡ هُوَ أَشَدُّ مِنۡهُ قُوَّةً وَأَكۡثَرُ جَمۡعٗاۚ
وَلَا يُسۡـَٔلُ عَن ذُنُوبِهِمُ ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴿٧٨﴾ فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوۡمِهِۦ
فِي زِينَتِهِۦۖ قَالَ ٱلَّذِينَ يُرِيدُونَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا يَٰلَيۡتَ لَنَا
مِثۡلَ مَآ أُوتِيَ قَٰرُونُ إِنَّهُۥ لَذُو حَظٍّ عَظِيمٖ ﴿٧٩﴾ وَقَالَ
ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ وَيۡلَكُمۡ ثَوَابُ ٱللَّهِ خَيۡرٞ لِّمَنۡ ءَامَنَ
وَعَمِلَ صَٰلِحٗاۚ وَلَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلصَّٰبِرُونَ ﴿٨٠﴾ فَخَسَفۡنَا
بِهِۦ وَبِدَارِهِ ٱلۡأَرۡضَ فَمَا كَانَ لَهُۥ مِن فِئَةٖ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ
ٱللَّهِ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلۡمُنتَصِرِينَ ﴿٨١﴾ وَأَصۡبَحَ ٱلَّذِينَ تَمَنَّوۡاْ
مَكَانَهُۥ بِٱلۡأَمۡسِ يَقُولُونَ وَيۡكَأَنَّ ٱللَّهَ يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن
يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦ وَيَقۡدِرُۖ لَوۡلَآ أَن مَّنَّ ٱللَّهُ عَلَيۡنَا لَخَسَفَ بِنَاۖ
وَيۡكَأَنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿٨٢﴾ تِلۡكَ ٱلدَّارُ ٱلۡأٓخِرَةُ نَجۡعَلُهَا
لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوّٗا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فَسَادٗاۚ وَٱلۡعَٰقِبَةُ لِلۡمُتَّقِينَ
﴿٨٣﴾ مَن جَآءَ بِٱلۡحَسَنَةِ فَلَهُۥ خَيۡرٞ مِّنۡهَاۖ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَلَا
يُجۡزَى ٱلَّذِينَ عَمِلُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ إِلَّا مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٨٤﴾

٣٩٥

**قاروون سەرو ماڵی چوو بەناخی زەویدا:**

﴿٨١ فخسفنا به و بداره الأرض﴾ جا سەرەنجام خۆیی و، خانووەكەیمان برد به ناخی زەوییدا بەسامان و گەنجینەكەشیەوه ﴿فما كان له من فئة ينصرونه من دون الله﴾ هیچ دەستەو كۆمەڵێكیش نەبوو تا لەسزای خوا یارمەتی بدات ﴿وما كان من المنتصرين﴾ و خۆیشی نەیتوانی یارمەتی خۆی بدات ﴿٨٢ و أصبح الذين تمنوا مكانه بالأمس﴾ ئەوانەی دوێنێ ئاواتیان ئەخواست لەجێی (قاروون) بوونایه ﴿يقولون و يكأن الله يبسط الرزق لمن يشاء من عباده و يقدر﴾ دەیانگوت: ئەی هاوار! بەس نەبوو ئێمەش وەكو ئەو تیانه چووین، سەیره خوا بۆ هەركەسێ خۆی بیەوێ لەبەندەكانی، ڕزق و ڕۆزی فراوان دەكات، وه تەنگ دەكا له هەركەسێ خۆی بیەوێ، ئەوەش لەبەر حیكمەتێكه خۆی دەیزانێ ﴿لولا أن من الله علينا﴾ خۆئەگەر خوا منەتی لەسەر ئێمە نەنابا ﴿لخسف بنا﴾ ئێمەیشی

ئەبرد بە ناخی زەوییدا، واتە: پاشە ڕۆژمان وەك قاروون دەبوو ﴿و یكأنه لا یفلح الكافرون﴾ سەیرە كافرو بێ بڕوایان ڕزگار نابن هەرچەندە ماوەیەكیش لەخۆشی دابن ﴿[٨٣] تلك الدار الآخرة نجعلها للذین لا یریدون علوا فی الارض ولا فسادا﴾ ئەو خانەیەی تر(بەهەشت) دادەنێین بۆ ئەوكەسانەی نایانەوێ دەعیەو خراپەكاریی بكەن لە زەوییدا وەك قاروون. ﴿و العاقبة للمتقین﴾ پاشەڕۆژی چاكیش هەر بۆ پارێزگارانە نەك بۆ لەخۆ بایی بووان بەكورسی، یان بەسامان و دارایی ﴿[٨٤] من جاء بالحسنة فله خیر منها﴾ ئەوەی كاروكردەوەیەكی چاك ئەنجام بدات، ئەوە چاكتر دێتە ڕێی و پاداشتی باشتری بۆ هەیە ﴿ومن جاء بالسیئة فلا یجزی الذین عملوا السیئات إلا ماكانوا یعملون﴾ هەركەسێكیش گوناهو كاری خراپ بكات، تۆڵەی تەنها بەرانبەر بەئەندازەی كاروكردەوەكەیانە.

الجزء العشرون　　سورة القصص

إِنَّ الَّذِي فَرَضَ عَلَيْكَ الْقُرْءَانَ لَرَادُّكَ إِلَىٰ مَعَادٍ قُل رَّبِّي أَعْلَمُ مَن جَاءَ بِالْهُدَىٰ وَمَنْ هُوَ فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٨٥﴾ وَمَا كُنتَ تَرْجُوا أَن يُلْقَىٰ إِلَيْكَ الْكِتَٰبُ إِلَّا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ فَلَا تَكُونَنَّ ظَهِيرًا لِّلْكَٰفِرِينَ ﴿٨٦﴾ وَلَا يَصُدُّنَّكَ عَنْ ءَايَٰتِ اللَّهِ بَعْدَ إِذْ أُنزِلَتْ إِلَيْكَ وَادْعُ إِلَىٰ رَبِّكَ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ الْمُشْرِكِينَ ﴿٨٧﴾ وَلَا تَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُ لَهُ الْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٨٨﴾

سُورَةُ الْعَنكَبُوتِ　ترتيبها ٢٩　آياتها ٦٩

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

الٓمٓ ﴿١﴾ أَحَسِبَ النَّاسُ أَن يُتْرَكُوا أَن يَقُولُوا ءَامَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ ﴿٢﴾ وَلَقَدْ فَتَنَّا الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَلَيَعْلَمَنَّ اللَّهُ الَّذِينَ صَدَقُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْكَٰذِبِينَ ﴿٣﴾ أَمْ حَسِبَ الَّذِينَ يَعْمَلُونَ السَّيِّـَٔاتِ أَن يَسْبِقُونَا سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴿٤﴾ مَن كَانَ يَرْجُوا لِقَاءَ اللَّهِ فَإِنَّ أَجَلَ اللَّهِ لَءَاتٍ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴿٥﴾ وَمَن جَٰهَدَ فَإِنَّمَا يُجَٰهِدُ لِنَفْسِهِ إِنَّ اللَّهَ لَغَنِيٌّ عَنِ الْعَٰلَمِينَ ﴿٦﴾

الحزب ٤٠

وَالَّذِينَ ءَامَنُوا　٣٩٦

**خوا بەهەق بناسە و كاری خۆت بكە:**

﴿[٨٥] إن الذی فرض علیك القرآن لرادك إلى معاد﴾ ئینجا بۆ دڵخۆشی پەیامبەرﷺ و هاوەڵانی ئەفەرمووێ: بەڕاستیی ئەو زاتەی خوێندن و گەیاندن و كار پێكردنی قورئانی لەسەر واجب كردیت، هەر ئەو زاتەش دەتگێڕێتەوە بۆ جێی لەدایك بوونت (شاری مەككە).. دیارە ئەمە موژدەی فەتحی مەككەیە، وە ئەم تەفسیرە رای (ئیبن عەبباس)ە، كە پێشەوا بوخاریش دەیهێنێ، جا بۆ زیادە زانیاریی تۆش دەتوانی سەیری تەفسیری (ئیبن كەسیر) بكەی. ئەوانە بەپێغەمبەریان ئەوت تۆ گومڕایت، بۆیە خوا ئەفەرمووێ: ﴿قل ربی أعلم من جاء بالهدی﴾ بڵێ: هەر پەروەردگاری من لە هەمووكەس زاناترە كە كێ هاتووە بە ڕێنمایی و هیدایەت ﴿ومن هو فی ضلال مبین﴾ وە كێش لە گومڕایی و سەر لێشێواوییەكی ئاشكرادایە ﴿[٨٦] و ما كنت ترجوا أن یلقی إلیك الكتاب إلا رحمة من ربك﴾ تۆیش ئەی محمدﷺ هەرگیز بەتەمای ئەم قورئانە نەبوویت بۆت بنێرری، بەڵام ڕەحمەتی پەروەردگاری تۆ وای خواست، بێ بڕواكان پێیان خۆش بوو كەپەیامبەرﷺ نەرمیەیەكیان نیشان بدات لەگەڵ خواكانیاندا، جاخواش فەرمووێ: ﴿فلا تكونن ظهیرا للكافرین﴾ ساتۆش هەرگیز پشتیوانی لە كافروبێبڕوایان مەكە ﴿[٨٧] ولا یصدنك عن آیات الله بعد إذ انزلت إلیك﴾ باكافرەكان ڕێگریت نەكەن لە گەیاندنی ئایەتەكانی خوا، دوای ئەوەی دابەزێنران بۆت ﴿و ادع إلى ربك﴾ بانگەواز بكە بۆلای ئاینی پەروەردگارت ﴿و لا تكونن من المشركین﴾ هەرگیز تۆ لەو موشریكانە مەبە ﴿[٨٨] و لا تدع مع الله إلها آخر﴾ لەگەڵ خوادا هانا بۆهیچ پەرستراوێكی ترمەبە ﴿لا إله إلا هو﴾چونكە جگە لەو هیچ پەرستراوێك بەهەق نیە ﴿كل شئ هالك إلا وجهه﴾ هەموو شتێك تیا دەچێت جگە لە ڕووخساری پیرۆزی ئەو نەبێ ئایەتی: (كل من علیها فان و یبقی وجه ربك ذو الجلال و الإكرام) ٥٥/٢٦-٢٧. وە فەرمایشتی: (و لا تطرد الذین یدعون ربهم بالغداة والعشی یریدون وجهه) ٦/ ٥٢. وە فەرمایشتی: (واصبر نفسك مع الذین یدعون ربهم بالغداة والعشی یریدون وجهه) ٢٨/١٨. وە

فەرمایشتی: (للذين يريدون وجه الله)٣٨/٣٠. وە فەرمایشتی: (إنما نطعمكم لوجه الله) ٩/٧٦. وە فەرمایشتی: (.. إلا ابتغاء وجه ربه الأعلى) ٢٠/٩٢. هەرپشتگیری لەومانایە دەکەن.

**تێبینی:** (وجه) یەکێکە لەو سیفەتانەی زانایانی (سەلەف) دەیدەنە پاڵ زاتی خوای پاك وبێخەوش وکارجوان، هەروەك ئەویش خۆی لەچەندین ئایەتدا دەیکاتە سیفەت بۆخۆی، بەلام بەبێ هیچ لێچووان و دەستکاریی و، لێکدانەوەیەك کە لەگەڵ زاتی بڵندی ئەودا نەگونجێت، ئێمەش هەروەك (سەلەف) ئەڵێن: (فنثبت له وجها كما أثبته لنفسه، و أثبته له نبيه من غير تعطيل و لا تمثيل، و كذا في سائر صفاته نثبتها له ولا نمثلها بصفات خلقه، فهو –جل وعلا– ليس كمثله شئ لا في ذاته ولا في صفاته، ونمر جميع آيات وأحاديث الصفات على ظاهرها ولا نحرفها أو نظن أن لها معنى يخالف ما دلت عليه ظاهرها، فظاهرها مراد)، فەرموودەیش زۆر زۆرە بۆ سەلماندنی سیفەتی (وەجه) بۆ خوایگەورە، وەك: ((أسألك لذة النظر إلى وجهك والشوق إلى لقائك..))، ((لا ينبغى أن يسأل بوجه الله إلا الجنة)) السنن. عن جابر بن عبد الله قال: ((لما نزلت هذه الآية: (قل هو القادر على أن يبعث عليكم عذابا من فوقكم) قال النبى ﷺ: ((أعوذ بوجهك)) فقال: (أو من تحت أرجلكم) ٦٥/٦، فقال النبى ﷺ: ((أعوذ بوجهك)) فقال: (أو يلبسكم شيعا) فقال النبي ﷺ: ((هذا ايسر)) رواه البخاري في صحيحه. وە ((جنتان من فضة آنيتهما وما فيهما، وجنتان من ذهب آنيتهما وما فيهما، وما بين القوم وبين أن ينظروا إلى ربهم إلا رداء الكبر على وجهه في جنة عدن)) متفق عليه. وە ((إن الله عزوجل لا ينام ولا ينبغى له أن ينام يخفض القسط ويرفعه، يرفع إليه عمل الليل قبل عمل النهار، وعمل النهار قبل عمل الليل حجابه النور –وفي رواية أبي بكر: (("النار" لو كشفه لأحرقت سبحات وجهه ما انتهى إليه بصره من خلقه)) رواه مسلم. ومعنى سبحات وجهه: (أي: نوره وجلاله وبهاؤه) مانای ئەم فەرموودەیە لە سوورەتی (نەمل)دا نووسراوە. جا بۆ زیاتر روون کردنەوە دەتوانی سەیری (الأسماء والصفات)ی ئیمامی (بەیهەقی) و (كتاب صفات الله عز وجل –صالح على المسند)یش بکەیت. دکتۆر (ئەحمەد الغامیدی) مامۆستای وانەی عەقیدە لەزانکۆی (أم القرى) لەپەراوێزی (شرح إعتقاد أهل السنة والجماعة..)ی (لالە کائی) بەرگی (٢) رووپەڕی (٤٥٧)دا بەسەرئەودەستەواژەیەدا، دەڵێ: (سياق ما دل من كتاب الله عز وجل وسنة رسوله ﷺ على أن من صفات الله عز وجل الوجه والعينين واليدين)، وە هەروەها دەڵێ: (هذا المبحث من الصفات يسميه أهل الكلام –الصفات السمعية– أي أنها تثبت بالسمع فقط، بخلاف الصفات السابقة، فإنها تثبت بالسمع والعقل، وفي هذه الصفات –كباقي الصفات المتقدمة ثلاثة مذاهب: الأول/ مذهب أهل السنة والجماعة وهو إثباتها لله عز وجل من غير تمثيل ولا تشبيه، الثاني/ مذهب الجهمية والمعتزلة والأشاعرة: أولوها، فقالوا المراد بالوجه، الذات، وبالعين: العلم، وباليد: النعمة..الخ). الثالث/ مذهب المشبهة الذين شبهوا صفاته –عز وجل– بصفات خلقه، وكلا المذهبين الأخيرين خاطىء، فقد أتى أصحابهما من قبل ظنهما للمشابهة بين صفات الله وصفات خلقه، فأما المؤولون فأدى بهم ذلك الظن إلى التأويل لئلايقع التشابه بين الله وخلقه. وأما المشبهة فقد ظنوا أن إتفاق الصفات في الأسماء يستلزم إتفاقهما في المسميات وهذا ظن ضال. والمؤولون فقد أثبت كل منهم لله عز وجل صفة أو إسما يشترك في بعضها المخلوقون مع الله عز وجل، فالمعتزلة أثبتت لله أسماء منها: العالم، والقادر ونحوها. والأشاعرة أثبتوا لله عز وجل سبع صفات هي: العلم، والحياة، والقدرة..الخ. والجميع –بما فيهم الجهمية– يثبتون لله عزوجل (ذاتا) وهذه جميعها توجد في المخلوقين، فكيف يوهم بعض الوارد في الخبر التشبيه، ولا يوهم البعض الآخر ذلك؟. ولو أنهم قالوا: كما أن لله ذاتا لا تشبه الذوات فكذلك لله صفات لا تشبه الصفات لانتهت المشكلة وسلموا من الشذوذ والإختلاف مع

سلف الأمة. ﴿له الحكم و إليه ترجعون﴾ بڕیار و دادوەری هەر شایستەی ئەوە، هەر بۆلای ئەویش دەگێردرێنەوەو. لەئایەتی: (ولا يشرك في حكمه أحدا) الكهف/٢٦ دا زیاتر تیشك خراوەتە سەرئەم مەسەلەی حوكم و بڕیاری خوایە.

زۆر سوپاس بۆ خوا لە (١٠)ی ذي الحجة (١٤١٦)ك بەرامبەر بە (١٩٩٦/٤/٢٨) لە شاری (مەریوان) لەم سوورەتە بوومەوە، یارمەتی بۆ تەواوكردنی سوورەتەكانی تر هەر لەخوا ئەخوازین.

*** *** ***

## ٢٩- سوورەتی( عەنكەبووت )ـە

## مەككەیییەو ( ٦٩ )ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتە وەك سوورەتە مەككەیییەكانی تریاسی: یەكتاپەرستیی، پەیام، زیندوو بوونەوە، پاداش و تۆڵە دەكات. دەشتوانین بڵێین تەوەرەكەی باسی (ئیبتلاء) و تاقیكردنەوەیمرۆڤەكانە، وەك هەرسوننەتێكی خوایی لەم ژیانەدا.. بەتایبەتی موسڵمانەكانی مەككە كە لەوپەڕی ئەشكەنجەو ئازاردا دەژیان، هەر بۆیەش خەریكە ئەو (ئیبتلاء)یە ببێ بە سەرباسی سەرەكیسوورەتەكە.. لەولایشەوە باسكردنی داستانی پەیامبەران هەر بۆ ئەو مەبەستەیە: (١الم * ٢ أحسب الناس أن يتركوا أن يقولوا آمنا وهم لا يفتنون؟) سەرزەنشتی خەڵكانێ دەكات كە پێیان وایە ئیمان وباوەڕ چەند وشەیە كی سەر زارەكی یە، نایەوێ لەپێناویا تووشی هیچ جۆرە ئەزیەتێك ببن، هەر بۆیە بە بەڵایەكی بچوكیش خێرا پاشگەز دەبنەوە!!: (ومن الناس من يقول آمنا بالله فإذا أوذي في الله جعل فتنة الناس كعذاب الله..). سوورەتەكە بەڵاو فیتنەی پەیامبەران لە پێناوی ئایینەكەیاندا دەگێڕێتەوە، كە چۆنیش خۆیان ڕاگرت و نەپسان، لە (نووح)ـەوە، ئینجا (ئیبراهیم)، پاشان (لووط، شوعەیب) عليه السلام هەروەك بەسەرهاتی گەلێ كەللە ڕەق و سەر سەخت باس دەكات وەك: (عاد، سەموود، قاروون، هامان.هتد).. لەگەڵ دیاریكردنی پاشەڕۆژو دەرەنجامیان: (فكلا أخذنا بذنبه فمنهم من أرسلنا عليه حاصبا..). داستانی پەیامبەران وانەی مەردایەتی و خۆڕاگریی و، كۆڵ نەدان نیشان ئەدات.. نووح عليه السلام (٩٥٠) ساڵ بێ وچان گەلەكەی خۆی بۆلای خوای گەورە بانگ دەكا، كەچی كەمێكیزۆر كەمینەیان بڕوایان هێنا!: (ولقد أرسلنا نوحا إلى قومه فلبث فيهم ألف سنة إلا خمسين عاما فأخذهم الطوفان وهم ظالمون) پاش ئەویش ئیبراهیم، و هەموو هەوڵەكانیشی لای ئەوان، هەر ئەوەبوو كە:گوتیان یان بیكوژن، یان بیسووتێنن: (قالوا اقتلوه أوحرقوه فأنجاه الله من النار...) لە داستانی لووتیشدا ئەوپەڕی بێ شەرمیی و یاخیی بوون لەگەلەكەیدا بەدی دەكرێت: (ولوطا إذ قال لقومه إنكم لتأتون الفاحشة ما سبقكم بها من أحد من العالمين) پاش ئەو داستانەش بە پەلە دەڕواتە سەر پەیامەكەی موحەممەد ﷺ، باسی ڕاستیی و دروستیی ئەو دەكات، كە لەگەڵ ئەوەیشدا نەخوێندەوار بووە (وماكنت تتلوا من قبله من كتاب ولا تخطه بيمينك إذا الارتاب المبطلون) ئەوجا بەدەست نیشانكردنیچەندین بەڵگەونیشانە بۆ دەسەڵات و توانای خوای گەورە كۆتایی دێ.

### سوننەتی خودایە دەشێ ئیماندار تاقیبكرێتەوە:

﴿بسم الله الرحمن الرحيم * ١ الم﴾ واتە:ئەم قورئانە هەر لەم پیتانە ڕێكخراوە، جا ئەگەر ئێوە ئەی خوانەناس و موشریكان! نكووڵی دەكەن، دەسافەرموون وێنەی بێنن ﴿٢ أحسب الناس أن يتركوا أن يقولوا آمنا وهم لا يفتنون﴾ ئاخۆ موسڵمانان-بەتایبەتی- موسڵمانانی مەككە، گومان وادەبەن كە ئەگەر هەر ئەوەندە بڵێن: بڕوامان هێناوە، ئیتر وازیان لێدەهێنرێ و، تاقیناكرێنەوە؟! نەخێر.. شتی وا نابێ ونەبووە بەڵكو پێویستە خەڵكی موسڵمان تاقی

بکرێنەوەو، لە بەرامبەریشیەوە، ئارامیان ببێ. ئیمامی (بوخاریی) لە (خەبباب)ەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەسێبەری کەعبەدا عەبایەکەی خۆی لەژێر سەرنابوو، ئێمەش سکالاًمان بردە لای و گوتمان: بۆ داوای یارمەتی و پشتیوانیمان بۆ ناکەی ئەی پێغەمبەر؟! بۆ هاوارمان نابەیتە لای خوا؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموودەیەکی بۆیان فەرموو، ئەمە بڕێکیەتی: ((لقد کان من قبلکم..)) واتە:بێگومان بەرلەئێوە هیوا هەبوودەهێنراو چاڵێکی بۆهەڵدەکنراو تووڕ ئەدرایە نێوی، پاشان بەشەقەمشار هەر لەسەرییەوە بۆ خوارەوە دەکرا بە دوولەتەوەو، بەشانەی ئاسن جەستەولاشەی دادەهێنراو هەرچی گۆشت و ئێسکی هەبوو لێیدەکرایەوە، کەچی هەر لەئایینەکەی وەرنەدەگەڕا! بەخوا سوێند، ئەم ئایینە وا سەردەکەوێت کە سوار لە (سەنعا)وە بۆ (حەزرەمەوت) بڕوا لە خوا نەبێ لەکەس نە ترسێت، یان مەگەر ترسی گورگی هەبێ کە لەمەڕەکانی بدات، بەڵام ئێوە پەلەدەکەن!. وە هەروەها ئەو مانایەش کە لێرەدا مەبەستە لەچەند ئایەتێکی تردا روون کراوەتەوە، وەك: (أم حسبتم أن تدخلوا الجنة ولما يأتكم مثل الذين خلوا من قبلكم مستهم البأساء والضراء وزلزلوا حتى يقول الرسول والذين آمنوا معه متى نصر الله ألا إن نصر الله قريب) ٢/٢١٤. وە لەسوورەتی ٣/١٤٣. وە لەسوورەتی ٣١/٤٧، وە ٣/١٧٩، وەسوورەتی ٣/١٥٤، وە سوورەتی ٩/١٦، لەهەندێ جێگای تریشدا ,هەمان مەبەست روونکراوەتەوە. ﴿[٣] ولقد فتنا الذين من قبلهم﴾ بە هەقیقەت ئێمە ئەوانەی پێش ئەوانمان –وەك ئیبراهیم ی خەلیل و، چەند گەلێکی دی– تاقیکردنەوە بەجۆرەها مەینەت وبەلاًّ" کەچی کۆڵیشیان نەدا، لەفەرموودەیەکی راست و دروستدا هاتووە کە: ((أشدُّ الناس بلاء، الأنبياءُ، ثم الصالحون، ثم الأمثلُ فالأمثلُ، يُبْتلى الرجلُ على حَسَبِ دينه، فإن كان في دينه صَلابةٌ زيد له في البلاء)). پێشەوا ئەحمەد. دەکەوابوو هەردەبێ ئەزموون وتاقیکردنەوە ببێ، هەرچەند ئەوکەسە پلەی بەرزیشی هەبێ لە ئاییندارێدا، بگرە تاپلەی بەرزتربێ، ئەزموونەکەشی سەختردەبێ. ﴿فليعلمن الله الذين صدقوا﴾ بێگومان خوا بەواقیعیی کەسانێك کەڕاستیان وتووەو بڕوایان هێناوە دیاریدەکا،واتە: تا بەخەڵکیان بناسێنێ و، بۆخۆیشیان بزانن کە چ پیاوێکن؟! ﴿وليعلمن الكاذبين﴾ وەدرۆزنانیش دیاری دەکا، تابناسرێن ودەرکەون. واتە: تابڕواداری راستەقینە لەبڕواداریناراست، بۆخەڵکی لێك بکرێتەوە ﴿[٤] أم حسب الذين يعملون السيئات أن يسبقونا﴾ یا ئەوانەی کە کاری خراپ ونادروست ئەنجام ئەدەن پێیان وایە کەلەدەستمان دەرئەچن وپێشمان ئەکەون ودەربازدەبن؟ ﴿ساء ما يحكمون﴾ ئەوانە چ داوەرییوبڕیارێکی خراپ ئەدەن ئەگەر پێیان وابێ.

## رەنجی تێکۆشەران لای خوا زایە نابێ:

﴿[٥] من كان يرجولقاءالله فإن اجل الله لآت﴾ ئەوەی ئومێدی بە گەیشتنی دیداری خوا هەبێ، با دڵنیابێت کە کاتیدیاریی کراوی خوا هەردێت و" ئەویش بەدیداری شاد دەبێت ﴿وهوالسميع العليم﴾ وە هەرئەو خوایشە زۆر ژنەواو بیسەرە "بۆ وتەی بەندەکانی" زۆریش زانایە" بەبیروباوەڕوکرداریان ﴿[٦] ومن جاهد فإنما يجاهد لنفسه﴾ ئەوەش کە خۆی ماندووبکاو"جیهادوتێکۆشان بکات لەپێناوی ئایینی خوادا" ئەوە تەنیا بۆ خۆی جیهاد ئەکات سوودو "کەڵکەکەی بۆخۆی ئەگەڕێتەوە"، وەك ئەفەرموێ: (من عمل صالحا فلنفسه...)(٤٥/١٥). ﴿إن الله لغني عن العالمين﴾ چونکە بەڕاستیی خوا لەتەواوی جیهانەکان بێ نیازە "پێویستی بەجیهادی هیچ کەسێك نییە، بەڵام هەوڵدان بۆلابردنیدڕك وداڵ لەبەردەم کۆمەڵ و کۆمەڵگەدا خزمەتێکی پێویستەو، کەڵکەکەشی بۆ خۆیی "و وڵات ونیشتمانی ئەگەڕێتەوە ﴿[٧] والذين آمنوا وعملوا الصالحات﴾ ئەوکەسانەش کە بڕوایان هێناوەوکاروکردەوەی چاك

ئەنجام دەدەن ﴿لنكفرن عنهم سيئاتهم﴾ ئەوە بێگومان چاوپۆشی‌دەکەین لە گوناح وتاوانەکانیان ﴿ولنجزينهم احسن الذی كانوا يعملون﴾ وە چاكتر لەوەی کردوویانە, پاداشیان ئەدەینەوە.

**لەگەڵ دایك و باوكدا چاكە بكە:**

﴿^٨ ووصينا الإنسان بوالديه حسنا﴾ ئێمە وەسیەتمان بەئادەمیزاد کرد کەلەگەڵ دایك وباوکیاچاکە بکا, واتە: هەمیشە کارچاك بێت لەگەڵیانداو، خۆی ماندووبکات بۆیان ﴿وإن جاهداك لتشرك بی ما ليس لك به علم﴾ ئەگەر ئەوان –دایك وباوك– زۆریان لێکردیت کە تۆشتیّ بکەیتە هاوەڵ وهاوبەش بۆخودا, کە هیچ زانست وزانیارییەکیشت پێی نیە ﴿فلا تطعهما﴾ ملکەچیان مەبەوبەگوێیان مەکە ﴿إلى مرجعكم﴾ دڵنیابن کە گەڕانەوەی هەمووتان هەر بۆلای منە لەڕۆژی قیامەتدا ﴿فأنبئكم بما كنتم تعملون﴾ ئینجا لەوڕۆژەدا لەوکردەوانەی ئەنجامتانداوە ئاگادارتان ئەکەم، هەریەکە بەگوێرەی کردەوەی خۆی پاداشت وەرئەگرێتەوە. (موصعەب) دەڵێ: چەندئایەتێکی قورئان لەبارەی منەوە هاتن. جارێکیان دایکم سوێندی لیّ خواردم کە نەئاو دەخۆمەوەو، نەنان دەخۆم و نەقسەشت لەگەڵ دەکەم، ئەگەر لە ئیسلام وەر نەگەڕێمەوە، جا ماوەی سیّ ڕۆژێك بەو شێوەیە مایەوە، سەرەنجام پەکی کەوت و بوورایەوە، پاشان (عەمارە)ی کوڕی ئاوی بۆ برد، ئەویش هەر خەریکبوو نزای لێدەکردم، جا خوای گەورە ئایەتی: (ووصينا الإنسان..)ی ناردە خواریّ. (ئیمامی موسلیم)هێناویەتی. ﴿^٩ والذين آمنوا وعملوا الصالحات﴾ ئەو کەسانەی وا بڕوایان هێناوە، چاکەکانیشیان کردووە ﴿لندخلنهم فی الصالحين﴾ دڵنیابن دەیانبەینە نێوڕیزی صاڵحان وچاکانەوە ﴿^١٠ ومن الناس من يقول آمنا بالله﴾ لەنێوەمەردومدا هێندیّ خەڵك هەیە دەڵێت: باوەڕمان بەخواهەیە ﴿فإذا اوذی فی الله﴾ کەچی کاتێکیش لەسەرخوا ئازاردرا ﴿جعل فتنة الناس كعذاب الله﴾ سزاوئازاری خەڵکی ,گێڕا وەکوسزای خوا، بۆیە دواییش خۆی بۆڕاناگیریّ و پاشگەزدەبێتەوە. مەبەست ومانای ئەم ئایەتە وەکومەبەست ومانای:(ومن الناس من يعبدالله‌علی‌حرف) ١١/٣٣، وایە ﴿ولئن جاء نصر من ربك﴾ ئەگەر سەرکەوتن و پیرۆزییەك لەلایەن پەروەردگارتەوە هاتبا ﴿ليقولن إنا كنا معكم﴾ دەیانگوت: بێگومان ئێمەش لەگەڵ ئێوەدا بووین "مەبەستیشیان هەر ئەوەیە کە لەدەستکەوتە جەنگییەکاندا شتێکیان دەست کەویّ. (الذين يتربصون بكم..) ٤/١٤١. وەئایەتی (وإن منكم لمن ليبطئن..) ٤/٧٢-٧٣. ڕاڤەیە بۆ ئەو مانایە. ﴿او ليس الله بأعلم بما فی صدور العالمين﴾ ئایاخوا زاناتر نیە بەوەی کە لەدڵ وسنگی هەموو خەڵکدایە؟ هەرچەندە ئەوانە بەزمان بڵێن باوەڕمان هەیە، بەڵام خوا خۆی چاك دەزانیّ دڵیان

سُورَةُ العَنكَبُوت — الجُزءُ العِشرُون

وَالَّذِينَ ءَامَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَنُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ
وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَحْسَنَ الَّذِي كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿٧﴾ وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ
بِوَالِدَيْهِ حُسْنًا وَإِن جَاهَدَاكَ لِتُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ
فَلَا تُطِعْهُمَا إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٨﴾
وَالَّذِينَ ءَامَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَنُدْخِلَنَّهُمْ فِي الصَّالِحِينَ
﴿٩﴾ وَمِنَ النَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِاللَّهِ فَإِذَا أُوذِيَ فِي اللَّهِ جَعَلَ
فِتْنَةَ النَّاسِ كَعَذَابِ اللَّهِ وَلَئِن جَاءَ نَصْرٌ مِّن رَّبِّكَ لَيَقُولُنَّ
إِنَّا كُنَّا مَعَكُمْ أَوَلَيْسَ اللَّهُ بِأَعْلَمَ بِمَا فِي صُدُورِ الْعَالَمِينَ
﴿١٠﴾ وَلَيَعْلَمَنَّ اللَّهُ الَّذِينَ ءَامَنُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْمُنَافِقِينَ
﴿١١﴾ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِلَّذِينَ ءَامَنُوا اتَّبِعُوا سَبِيلَنَا
وَلْنَحْمِلْ خَطَايَاكُمْ وَمَا هُم بِحَامِلِينَ مِنْ خَطَايَاهُم مِّن
شَيْءٍ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ ﴿١٢﴾ وَلَيَحْمِلُنَّ أَثْقَالَهُمْ وَأَثْقَالًا
مَّعَ أَثْقَالِهِمْ وَلَيُسْأَلُنَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَمَّا كَانُوا يَفْتَرُونَ
﴿١٣﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِ فَلَبِثَ فِيهِمْ أَلْفَ سَنَةٍ
إِلَّا خَمْسِينَ عَامًا فَأَخَذَهُمُ الطُّوفَانُ وَهُمْ ظَالِمُونَ ﴿١٤﴾

٣٩٧

چی تێدایه.(زوحاك) ئەڵێ: ئەم ئایەتە لەبارەی چەند کەسێکی دووڕوو هاتە خوارێ، کاتێ کە لەمەککەدا بوون و بڕوایان هێنابوو، جا ئەو دەمەی کە سزاو ئازاردران، بەخێرایی چونەوە سەر شیرکە کۆنەکەی جارانیان.

**دووڕوو درۆزنە :**

﴿[11] وليعلمن الله الذين آمنوا وليعلمن المنافقين﴾ بەڕاستیی خودا زۆر بەچاکی ئەوانەدیاریدەکاودەناسێ کە بڕوایان هێناوە، دوو ڕووەکانیش هەروا ئەناسێ و ئەزانێ کێن، واتە: ئەوەی کە بەڕاستیی باوەڕی هێنابێت ,ئەوکەسەش کە بەشك و گومانە، هەر لای خوا ئاشکران ﴿[12] وقال الذين كفروا للذين آمنوا اتبعوا سبيلنا﴾ کافرو بێ بڕوایانی قورەیش بە بڕوادارانیان وت: پەیڕەوی لە ڕێبازی ئێمە بکەن ,واتە:شوێنی ئایینی ئێمە بکەون ﴿ولنحمل خطاياكم﴾ ئێمەش گوناهەکانتان بۆهەڵدەگرین ﴿وماهم بحاملين من خطاياهم من شئ﴾ خۆناشتوانن لەقیامەتدا بەشێکی زۆرکەمیش لەگوناحیان بۆ هەڵگرن ﴿إنهم لكاذبون﴾ بەڕاستییئەوانە هەر درۆزنن ﴿[13] وليحملن أثقالهم وأثقالا مع أثقالهم﴾ دلنیابن کە گوناهی سەنگینی خۆیان و, هەندێ باری تریش لەگەڵ باری گرانیخۆیان هەڵدەگرن ودەبێتە سەرباریان ,واتە: گوناحی ئەوانەش دێتە ملیان ,چەواشەو سەرلێشێواویان کردوون ﴿وليسئلن يوم القيامة عما كانوا يفترون﴾ و بەڕاستیی لە ڕۆژی قیامەتیشدا بەرپرسیارن لەو درۆو دەلەسانەی هەڵیان بەست.ئایەتی (ليحملوا أوزارهم..) ١٦/٢٥. پشتگیری ئەم مەبەستە ئەکات.

**نووح و نەتەوەکەی:**

جا بۆدڵدانەوەی پەیامبەر ﷺ خوا ئەفەرموێ: ﴿[14] ولقدأرسلنا نوحا إلى قومه﴾ بەڕاستیی ئێمە (نووح)مان‌ؑ ناردە لای هۆزو گەلەکەی خۆی, بۆئەوەی یەکتاناسینیان پێرابگەیەنێت ﴿فلبث فيهم ألف سنة إلا خمسين عاما﴾ جائەویش ئەوەبوو بێ وچان قۆڵی لێ هەڵماڵی , هەزار ساڵ -پەنجا کەم- لەناویاندا مایەوەو ژیا، بەشەوو بەڕۆژ، بەئاشکراو بەنهێنی، تێ دەکۆشاو بانگی ئەکردن بۆ لای خوا، کەچی ئەوان ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بۆپەرستنی بتەکانیان" سوورتر دەبوون ﴿فأخذهم الطوفان وهم ظالمون﴾ جا دەرەنجام تۆفان و سێڵاو هەموویانی گرت، چوون ئەوان ستەمکار بوون ﴿[15] فأنجيناه وأصحاب السفينة﴾ ئینجا نوح و ئەوانەی کە لەکەشتیەکەدا بوون ,لەزریان وتۆفانەکە ڕزگارمان کردن ﴿وجعلناها آية للعالمين﴾ و ئەو بەسەرهاتوو ڕووداوەشمان کردە پەندوئامۆژگاریەك بۆهەمووخەڵکیدونیا , ئەوەبوو تالەسەرەتای هاتنی ئیسلامیش, شوێنەواری کەشتیەکە لەسەر (کێوی جودی-هەڵگورد) مابوویەوەو، خەڵکانیش لەم لاو لەولاوە ئەهاتن سەیریان ئەکرد، جا کەواتە تۆش ئەی پەیامبەر ﷺ لە ئازاروئەزیەتی قورەیش، قەت بێ

الجزء العشرون | سورة العنكبوت

فأنجينه وأصحب السفينة وجعلنها آية للعلمين
(١٥) وإبرهيم إذ قال لقومه اعبدوا الله واتقوه ذلكم
خير لكم إن كنتم تعلمون (١٦) إنما تعبدون من
دون الله أوثنا وتخلقون إفكا إن الذين تعبدون من
دون الله لا يملكون لكم رزقا فابتغوا عند الله الرزق
واعبدوه واشكروا له إليه ترجعون (١٧) وإن تكذبوا
فقد كذب أمم من قبلكم وما على الرسول إلا البلغ
المبين (١٨) أولم يروا كيف يبدئ الله الخلق ثم
يعيده إن ذلك على الله يسير (١٩) قل سيروا في الأرض
فانظروا كيف بدأ الخلق ثم الله ينشئ النشأة الآخرة
إن الله على كل شيء قدير (٢٠) يعذب من يشاء ويرحم
من يشاء وإليه تقلبون (٢١) وما أنتم بمعجزين في
الأرض ولا في السماء وما لكم من دون الله من ولي
ولا نصير (٢٢) والذين كفروا بآيت الله ولقائه
أولئك يئسوا من رحمتي وأولئك لهم عذاب أليم (٢٣)

فما كان ٢٩٨

تاقەت مەبە، چونكە پاشەڕۆژی باش هەربۆتۆ ئەبێ و، سەرەنجام ئەوانیش تیا ئەچن. سوورەتی (٣٦/٤١-٤٢) و چەند سوورەتێكی تری قورئان, ئەوحەقیقەت وراستیە ڕۆشن ئەكاتەوە.

## ئیبراهیم و قەومەكەی:

ئینجادێتە سەرباسی داستانەكەی ئیبراهیم ﵇ و ئەفەرموێ: ﴿[١٦]وإبراهيم إذ قال لقومه﴾ ئەی پێغەمبەر! باسیئیبراهیم بكە,كاتێ بەهۆزوگەلەكەی خۆی گوت: ﴿اعبدوا الله واتقوه﴾ تەنهاخوا بپەرستن و، هەر لەویش بترسن وخۆبپارێزن ﴿ذلكم خير لكم إن كنتم تعلمون﴾ ئەوەی من فەرمانتان پێ ئەكەم لەپەرەستنی خودا بەتەنیاو تەقوا چاكترە بۆتان، ئەگەر بزانن ﴿[١٧] إنما تعبدون من دون الله أوثانا﴾ ئێوە لەباتی خودا ,هەر چەند بتێك دەپەرستن ﴿وتخلقون إفكا﴾ ودرۆی زۆر گەورەش هەڵئەبەستن، كەپێیان دەڵێن خوا و، دەیانپەرستن ﴿إن الذين تعبدون من دون الله لا يملكون لكم رزقاً﴾ خۆئەوانەی ئێوە ئەیانپەرستن لە باتی خوا ,هیچ رزقێكی ئێوەیان بەدەست نیە ﴿فابتغوا عند الله الرزق﴾ جا كەواتە تەنها لای خوا داوای ڕزق و ڕۆزی بكەن ﴿واعبدوه واشكروا له﴾ وهەرئەویش بپەرستن و، سوپاسی بكەن. سوورەتی (١٦/٧٣): (ويعبدون من دون الله..) جەخت لەسەر یەكخوا پەرستی ئەكات ﴿إليه ترجعون﴾ هەمووتان هەربۆلای ئەو ئەگەڕێنرێنەوە بۆ پاداش و تۆڵە. ئینجا هەڕەشەیان لێ ئەكا و ئەفەرمووێ: ﴿[١٨]وإن تكذبوا فقد كذب أمم من قبلكم﴾ ئەگەر ئێوە بە درۆزنم بكەن , هیچ زیانێكم پێ ناگەیەنن ,چونكە پێش ئێوەش خەڵكانێكی زۆر بڕوایان بەپەیامبەرەكانیان نەكردو بەدرۆزنیان كردن، خوایش سزای توندی دان، جا ئەگەر ئێوەش وەك ئەوانە دەبن، ئەوا چارەنووستان هەروا ئەبێ ﴿وما على الرسول إلا البلاغ المبين﴾ ئیتر بێجگە لەڕاگەیاندنێكی روون و ئاشكرا, شتێكی دیكە لەسەرشانی پێغەمبەر نیەو, گوناهی خۆتان لەسەر خۆتانە.

## بەڵگەكانی ژیانەوەی پاش مردن:

خوا ئەیەوێ مەسەلەی زیندوو بوونەوەیان پێ بسەلمێنێ، بۆیە ئەفەرموێ: ﴿[١٩]أولم يروا كيف يبدئ الله الخلق ثم يعيده﴾ ئەرێ نەیانبینی هۆزەكەت چۆن خوا دروستكراوی خۆی لەنەبوونەوە دەست پێدەكات وئەیهێنێتە خانەی بوونەكانەوە لەپاشا دوای مردن ئەیگرێتەوە و وەك خۆی لێ ئەكاتەوە﴿إن ذلك على الله يسير﴾ بەڕاستیی بۆ خوا زۆر ئاسانە بەپێی باوی ئێمە سەخت وگرانە، ئەگینا بۆ خوا هەردوو بارەكەی یەكسانە ﴿[٢٠] قل سيروا في الأرض فانظروا كيف بدأ الخلق﴾ ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ:بگەڕێن گەشتی زەوی بكەن و، بنواڕن خوا چۆن خەڵقی جیهانی دەسپێكرد؟﴿ثم الله ينشئ النشأة الآخرة﴾ لە پاشاهەرئەوخوایە سەر لەنوێ، ئەو جیهانەكەیش دێنێ ﴿إن الله على كل شئ قدير﴾ بەراستی خوا بەسەر هەموو شتێكا بەتوانایە ﴿[٢١] يعذب من يشاء ويرحم من يشاء﴾ هەرلە دونیادابەمەیلیخۆی بیەوێ سزای كێ بدا ئەیدات،بیشیەوێ رەحم بەكێ بكا -شیاویش بێت- ئەی كا، هیچ كەسێك ناتوانێت ڕێی لێ بگرێ و نەهێڵێ " ﴿وإليه تقلبون﴾ سەرەنجامیش هەر بۆ لایخۆیدەتانهێننەوەلە پاشە ڕۆژدا ﴿[٢٢] وما أنتم بمعجزين في الأرض ولا في السماء﴾ وە ئێوە ناتوانن لە ژێر دەسەڵاتی خوا هەڵبێن ودەرچن ولە ئیشەكانی دا ناتەوانی بكەن نەلە زەویدا و، نەلە ئاسماندا ﴿وما لكم من دون الله من ولي ولا نصير﴾ هیچ سەپەرشتیكەرێك و یارمەتی دەرێكیش بێجگە لەخوا نییە فریاتان بكە وێ ویارمەتیتان بدات " ﴿[٢٣] والذين كفروا بآيات الله ولقائه﴾ ئەوكەسانەی بڕوایان نەكرد بەئایەت و بەڵگەكانی خواو، بەدیدارو خزمە تگەیشتنی، بۆ لێپرسینەوە ﴿أولئك يئسوا من رحمتي﴾ دیارە ئەوانە مەیووس و بێ هیوان لە بەزەیی و دلۆڤانی من، بۆیە ئاوا حاشا لەئایەت و لەدیدارم دەكەن ﴿وأولئك لهم عذاب أليم﴾ و ئەوانە سزایەكی زۆر بەژان وبەئێش ئامادە یە بۆیان.

## گوتیان: ئیبراهیم بکوژن، یان بیسووتێنن:

پاش ئەوەی ئیبراهیم پێغەمبەر ئەو هەموو بەڵگانەی بۆ هێناوە ئیتر ئەوان پەکیان ئەکەوێ و، پەنا دەبەنە بەرهێزو بەکار هێنانی دەسەلات، وەك ئەفەرموێ: ﴿[٢٤] فما كان جواب قومه إلا ان قالوا اقتلوه أوحرقوه﴾ وەلامی قەوم و گەلە کەی ئیبراهیم هەر ئەوە بوو وتیان: بیکوژن یان بیسوتێنن بۆیە ئاگریان بۆ سازداو فرێیان دایە ناوی ﴿فأنجاه الله من النار﴾، ئینجا خوا لەو ئاگرە ڕزگاری کرد وبە فەرمانی خۆی نەسووتا ﴿إن فی ذلك لآيات لقوم يؤمنون﴾ بەڕاستی ئالەوەدا چەندین بەڵگەی ڕوون هەیە بۆئەو کەسانەی باوەڕیان هێناوەو دەیهێنن چونکە کاتێ ئاگر هێزی سوتاندنی نەمێنێ، پێو یستە وانەی عیبرەتی لێ وەر بگیردرێ ﴿[٢٥] وقال إنما اتخذتم من دون الله اوثانا﴾ کاتێ ئیبراهیم لەئاگرەکە ڕزگاری بوو پێی وتن: بەڕاستی ئێوە بۆیە لەباتی خوابتان دەپەرستن ﴿مودة بينكم فی الحياة الدنيا﴾ کە لەم ژینی دونیایەدا یەکترتان خۆش دەوێ" واتە: خۆشەویستی و دۆستی و ڕیزدانانتان لەنێوان یەکتردایەوادەکا، تا بەو هۆیەوەش ببنە حیزب و کۆمەڵێك! ﴿ثم يوم القيامة يكفر بعضكم ببعض﴾ پاشان لەڕۆژی قیامەتا -هەر یەك لە پەرەستراو وپەرستیار- تەبەڕا لەوی دیکە دەکەن و، پەرەستراوەکان بە عیبادەتی پەرستیارەکان کافرن ودەبنە دوژمن بۆیان, وەك خودا دەفەرموێ: (وإذا حشر الناس كانوا لهم أعداء وكانوا بعبادتهم كافرين). ﴿ويلعن بعضكم بعضا﴾ ولەیەکتر نەفرین ئەکەن ﴿ومأوكم النار ومالكم من ناصرين﴾ و شوێن و جێگەیشتان ئاگری دۆزەخ ئەبێ و، هیچ یاریدەدەرێکیشتان بۆ نابێ "تا لەو سزایە ڕزگارتان بکات.

## لووط باوەڕی بە ئیبراهیم هێناو, پێکەوە هیجرەتیان کرد:

﴿[٢٦] فآمن لە لوط﴾، (لووط)ی برازای ئیبراهیم , پاش ڕزگار بوونی ئیبراهیم لەئاگرەکە باوەڕی هێناپێی ﴿وقال إنی مهاجر إلی ربی﴾ (ئیبراهیم) یش دوای ئەوە نائومێد بوو لە قەومەکەی پێی وتن: بێگومان من بۆلای پەروەردگارم کۆچ ئەکەم و (سەوادولعێراق) جێ دێڵم و، بەرەو فەلەستین و شام ئەڕۆم ﴿إنه هو العزيز الحكيم﴾ چونکە تەنها ئەوە دەسەلاتداری کارجوان ﴿[٢٧] ووهبنا له إسحاق ويعقوب﴾ وە(ئیسحاق)مان پێبەخشی، (یەعقووب)یشمان بە (ئیسحاق) بەخشی ﴿وجعلنا فی ذريته النبوة والكتاب﴾ پەیامبەرایەتیی و، نامەمان کردە کاڵای باڵای نەوەکانی: واتە دوای ئیبراهیم هەرکتێب و نامەیە هاتبێ هەر بەنەوەکانی ئەو دراوە" ﴿وآتيناه اجره فی الدنيا﴾ هەر لەدونیایشدا پاداشمان دایەوە ,بەناوو شۆرەتی چاك ﴿وإنه فی الآخرة لمن الصالحين﴾ وە لەپاشە ڕۆژیشدا لەڕیزی صاڵحاندایە.

الجزء العشرون — سورة العنكبوت

فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ ٱقْتُلُوهُ أَوْ حَرِّقُوهُ
فَأَنجَىٰهُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلنَّارِ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ
﴿٢٤﴾ وَقَالَ إِنَّمَا ٱتَّخَذْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ أَوْثَٰنًا مَّوَدَّةَ بَيْنِكُمْ
فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ ثُمَّ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكْفُرُ بَعْضُكُم
بِبَعْضٍ وَيَلْعَنُ بَعْضُكُم بَعْضًا وَمَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ
وَمَا لَكُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٢٥﴾ ۞ فَـَٔامَنَ لَهُۥ لُوطٌ ۘ وَقَالَ
إِنِّى مُهَاجِرٌ إِلَىٰ رَبِّىٓ ۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢٦﴾ وَوَهَبْنَا
لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَجَعَلْنَا فِى ذُرِّيَّتِهِ ٱلنُّبُوَّةَ وَٱلْكِتَٰبَ
وَءَاتَيْنَٰهُ أَجْرَهُۥ فِى ٱلدُّنْيَا ۖ وَإِنَّهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ
﴿٢٧﴾ وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ
مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٨﴾
أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ وَتَقْطَعُونَ ٱلسَّبِيلَ وَتَأْتُونَ
فِى نَادِيكُمُ ٱلْمُنكَرَ ۖ فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ
أَن قَالُوا۟ ٱئْتِنَا بِعَذَابِ ٱللَّهِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ
﴿٢٩﴾ قَالَ رَبِّ ٱنصُرْنِى عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٣٠﴾

٣٩٩

**لووط پەندی قەومەکەی دادەدات:**

﴿[٢٨] ولوطا إذ قال لقومه﴾لووطیشمان کردە پێغەمبەرو بە گەلەکەی خۆی وت: ﴿[٢٩] إنکم لتأتون الفاحشة﴾
بەڕاستی ئێوە ئەوەندە تاوانیخراپ و ناشرین ئەنجام ئەدەن" لەوپەڕی شەرمەزارییدایە!!" ﴿ماسبقکم بها من احد
من العالمین﴾ و یەك لەخەڵکانی جیهانیش پێش ئێوە کاری ناشیاوی وایەنەکردووە "ئەوەندە کارێکی نامرۆڤانەیە"
﴿ائنکم لتأتون الرجال﴾ ئەریٚ ئێوە دەچنە لای پیاوان و نێرینە "کە بەڕاستی ئەوپەڕی نامەردانەیە" ﴿وتقطعون
السبیل﴾ ریٚ لە دەوامی بەرەی مرۆ ئەبڕن،یان ڕێ لەخەڵکی ئەبڕن و ئەیشیکوژن و شتومەکەکانی لیٚ وەرئەگرن و
دەست درێژیشی بۆ ئەکەن! ﴿وتأتون فی نادیکم المنکر﴾ وە لەیانەی کۆبوونەوەی خۆتاندا کاری زۆر خراپ و
دزێوو ناحەز ئەکەن؟! ﴿فما کان جواب قومه﴾ کەچی پاش
ئەو هەموو ئامۆژگاری‌یە، وەڵامی گەلەکەی هەر ئەوەبوو ﴿إلا
أن قالوا ائتنا بعذاب الله إن کنت من الصادقین﴾ "بەگاڵتەوە"
بەلوطیان وت: ئەگەر لەڕاست بێژانی ئادەی سزای خوامان
بۆ بێنە" کە تۆهەموو جار هەڕەشەی پیٚ ئەکەیت" ﴿[٣٠] قال
رب انصرنی علی القوم المفسدین﴾ لووط کاتیٚ نائومێد بوو
لێیان وتی: ئەی پەروەردگارم! بەسەر ئەو گەلە خراپکارەدا
- کەهەرچی گیانیانە بیٚ ئەخلاقییە- سەرمخە ﴿[٣١]
ولماجاءت رسلنا إبراهیم بالبشری﴾ دوای داوای (لوط) بۆ
لەناوبردنیان، خوا کۆمەڵیٚ فریشتە ئەنێریٚ بۆئەنجامدانی
ئەوکارە، جاپێش ئەوەبچن بۆکارەکەیان، دەڕۆنە لای
(ئیبراهیم) وەك ئەفەرمویٚ: کاتیٚ کە نێرراوەکانمان هاتنەلای
ئیبراهیم بەموژدەوە,واتە:بەموژدەی هاتنە دونیای ئیسحاق
﴿قالوا إنا مهلکوا اهل هذه القریة﴾ بە ئیبراهیمیان وت:
بەڕاستیی ئێمە خەڵکی ئەم شاروێیە "سەدووم -دێی گەلی
لووط- لەناوبەرین ﴿إن اهلها کانوا ظالمین﴾ چونکە
خەڵکەکەی‌زۆر ناهەقکارو بیٚڕەوشت ولەسنوور دەرچوون.

سُورَةُ العَنكَبُوت — الجُزءُ العِشرُون

وَلَمَّا جَاءَتْ رُسُلُنَا إِبْرَاهِيمَ بِالْبُشْرَىٰ قَالُوا إِنَّا مُهْلِكُوا أَهْلِ هَٰذِهِ الْقَرْيَةِ ۖ إِنَّ أَهْلَهَا كَانُوا ظَالِمِينَ ﴿٣١﴾ قَالَ إِنَّ فِيهَا لُوطًا ۚ قَالُوا نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَن فِيهَا ۖ لَنُنَجِّيَنَّهُ وَأَهْلَهُ إِلَّا امْرَأَتَهُ كَانَتْ مِنَ الْغَابِرِينَ ﴿٣٢﴾ وَلَمَّا أَن جَاءَتْ رُسُلُنَا لُوطًا سِيءَ بِهِمْ وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعًا وَقَالُوا لَا تَخَفْ وَلَا تَحْزَنْ ۖ إِنَّا مُنَجُّوكَ وَأَهْلَكَ إِلَّا امْرَأَتَكَ كَانَتْ مِنَ الْغَابِرِينَ ﴿٣٣﴾ إِنَّا مُنزِلُونَ عَلَىٰ أَهْلِ هَٰذِهِ الْقَرْيَةِ رِجْزًا مِّنَ السَّمَاءِ بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ ﴿٣٤﴾ وَلَقَد تَّرَكْنَا مِنْهَا آيَةً بَيِّنَةً لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٣٥﴾ وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا فَقَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَارْجُوا الْيَوْمَ الْآخِرَ وَلَا تَعْثَوْا فِي الْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٣٦﴾ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَتْهُمُ الرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُوا فِي دَارِهِمْ جَاثِمِينَ ﴿٣٧﴾ وَعَادًا وَثَمُودَ وَقَد تَّبَيَّنَ لَكُم مِّن مَّسَاكِنِهِمْ ۖ وَزَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ أَعْمَالَهُمْ فَصَدَّهُمْ عَنِ السَّبِيلِ وَكَانُوا مُسْتَبْصِرِينَ ﴿٣٨﴾

وَقَـٰرُونَ — ٤٠٠

**فریشتە دێنە لای ئیبراهیم و لووط:**

﴿[٣٢] قال إن فیها لوطا﴾ ئیبراهیم کە ئەوەی لیٚ بیستن وتی: دەی خۆ لووتیشی تێدایە؟! ﴿قالوا نحن اعلم بمن
فیها﴾ فریشتەکان وتیان: ئێمە زاناترین بەوەی تێدایە؟ ﴿لننجینه واهله إلا إمراته کانت من الغابرین﴾ بێگومان
لووت وخانەوادەکەی-دووکچەکەی- رزگاردەکەین,ژنەکەی نا, چوون برپارە ئەو لەناو گوناهبارانـدا دەمێنێتەوەو
تیادەچێت" چونکە کاتی‌خۆی بەو کارەی ئەوانە رازی بووە"﴿[٣٣] ولما أن جاءت رسلنا لوطا سئ بهم وضاق بهم
ذرعا﴾ پاشان نێرراوەکانمان لای ئیبراهیم هەڵسان و بەرەو لووت چوون، کاتیٚ چوونە لای، بەدیتنیان
ترساودڵتەنگ بوو" لەترسی هۆزەکەی، نەوەك بێن دەرگایان پیٚ بگرن، جا ئەوانیش لووتیان تێگەیاند ﴿وقالوا لا
تخف ولا تحزن﴾ ووتیان: مەترسە و دڵ تەنگ مەبە" بەهۆی ئێمەوە" ﴿إنا منجوك واهلك إلا امراتك کانت من

الغابرين﴾ چونکە بێ گومان ئێمەخۆ تۆو خانەوادەکەت- ژنەکەت نەبێ- رزگاردەکەین کەئەولەڕیزیبەجێماوانایە.
﴿[٣٤] إنا منزلون على اهل هذه القرية رجزا من السماء﴾ ئێمە لە ئاسمانەوە بەڵاو سزایەکی سەخت ئەنێرینە سەر خەڵکی ئەم شارەدێیە ﴿بماكانوا يفسقون﴾ بەهۆی گوناهو تاوان و لەسنوور دەرچوونیانەوە "ئیبن کەسیر ئەڵێ: خوا جوبرەئیلی ناردو گوندەکەی بەرز کردەوەو لەئاستی سەریاندا رای گرت، پاشان کوتای بەسەریانداو بەرەدبارانی کردن و جێگەکەیان بووە بە دەریایەکی (پیس و بۆگەن) زۆربەی ڕا لەسەر ئەوەیە کەئەودەریایە، (بحرالميت)ی ئێستایە ﴿[٣٥] ولقد تركنا منها آية بينة لقوم يعقلون﴾ بەهەقیقەت لەو شارەدێیە وێرانەدا نیشانەیەکی ڕۆشنمان بەجێ هێشت بۆ کەسانێك لەونیشانەڕادەمێنن و تێدەگە.

### کورتە باسێکی شوعەیب:

دێتە سەرباسی چیرۆکی شوعەیبی پەیامبەر(عليه السلام) بۆیە ئەفەرموێ: ﴿[٣٦] وإلى مدين اخاهم شعيبا﴾ هەروا شوعەیبیبرایانیشمان-برای بنەچەییان- بەپێغەمبەری ڕەوانە کرد بۆمەدیەن ﴿فقال يا قوم اعبدوا الله وارجوا اليوم الآخر﴾ ڕۆیشتە لایان و فەرمووی: ئەی قەوم وهۆزم! تەنها خوا بپەرستن، وە بەڕۆژی دوایی ئومێدتان بێو" لەسزایشی بترسن" ﴿ولا تعثوا في الأرض مفسدين﴾ کاری بەدکارانەوگێرەشێوێنی مەکەن لەم زەویەدا,واتە: هەوڵی بڵاوکردنەوەی فەساد وتاوان مەدەن و، گێرەشێوێن مەبن
﴿[٣٧] فكذبوه فأخذتهم الرجفة﴾ کەچی خەڵکەکە بەدرۆزنیان کرد، ئینجا بوومەلەرزەیەکی گەورەی وا گرتنیو وڵاتەکەیانی بەیەکجاری وێران کرد ﴿فأصبحوا في دارهم جاثمين﴾ جاهەرهەموویان لەماڵەکانیاندا بەچۆکدا کەوتن ومردن.

وَقَٰرُونَ وَفِرۡعَوۡنَ وَهَٰمَٰنَۖ وَلَقَدۡ جَآءَهُم مُّوسَىٰ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَٱسۡتَكۡبَرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا كَانُواْ سَٰبِقِينَ ٣٩ فَكُلًّا أَخَذۡنَا بِذَنۢبِهِۦۖ فَمِنۡهُم مَّنۡ أَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِ حَاصِبٗا وَمِنۡهُم مَّنۡ أَخَذَتۡهُ ٱلصَّيۡحَةُ وَمِنۡهُم مَّنۡ خَسَفۡنَا بِهِ ٱلۡأَرۡضَ وَمِنۡهُم مَّنۡ أَغۡرَقۡنَاۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظۡلِمَهُمۡ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ٤٠ مَثَلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوۡلِيَآءَ كَمَثَلِ ٱلۡعَنكَبُوتِ ٱتَّخَذَتۡ بَيۡتٗاۖ وَإِنَّ أَوۡهَنَ ٱلۡبُيُوتِ لَبَيۡتُ ٱلۡعَنكَبُوتِۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ٤١ إِنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا يَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ مِن شَيۡءٖۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ٤٢ وَتِلۡكَ ٱلۡأَمۡثَٰلُ نَضۡرِبُهَا لِلنَّاسِۖ وَمَا يَعۡقِلُهَآ إِلَّا ٱلۡعَٰلِمُونَ ٤٣ خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِٱلۡحَقِّۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ٤٤ ٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَۖ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِۗ وَلَذِكۡرُ ٱللَّهِ أَكۡبَرُۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تَصۡنَعُونَ ٤٥



### ئەم قەومانەش فڕبوون:

﴿[٣٨] وعادا وثمود وقد تبين لكم من مساكنهم﴾ وە (عاد- گەلی هوود- سەموود- گەلی صالح)یشمان لەناو بردن، ئێستاش شوێنەوارەکانیان ببینن -ئەی دانیشتوانی مەککە!- جادەزانن چیمان پێکردوون، دەبۆئێوەش ژێر نابن؟ ﴿وزين لهم الشطان اعمالهم﴾ شەیتان کاروکردەوەکانیانی بۆرازاندنەوە, ئەوەبوو ئەوکارە نامەردانەیان لاچاك بوو ﴿فصدهم عن السبيل﴾ جا لەڕێگەو ڕێبازی ڕاستیش ڕێگری کردن ﴿وكانوا مستبصرين﴾ لەکاتێکدا خەڵکێکی وردبین بوون و، عەقڵیان بەچاك و خراپ ئەشکا ﴿[٣٩] وقارون وفرعون وهامان﴾ هەروەها قارونی سەرمایەدارو, فیرعەونی پاشای میسرو, هامانی وەزیری فیرعەونمان لەناوبردن ﴿ولقد جاءهم موسى بالبينات﴾ بە هەقیقەت موسا بەگەڵێ موعجیزەو بەڵگەی ئاشکراو ڕوونەوە هاتە لایان ﴿فاستكبروا في الأرض﴾ کەچی لەسەر زەوییدا خۆیان بە زل زانیی و، لە خۆیان گۆران و، دەستیان کردە دەعیەو فیز ﴿وما كانوا سابقين﴾ و نەشیان توانی پێشمان لێ بگرن و دەرچن لەدەستمان ﴿[٤٠] فكلا

اخذنا بذنبه﴾ جا ئێمە هەریەك لەوانمان بەهۆی گوناهی خۆیانەوە قار لێگرت ﴿فمنهم من أرسلنا علیه حاصبا﴾ جا هیوایان هەبوو خێزو لممان بەسەریاندا ڕشت لەگەڵ بای زۆرتوندوو سەخت و کوشندەدا وەك گەلی عاد ﴿ومنهم من اخذته الصیحة﴾ هەیان بوو دەنگ ونارەتەو هاوارێکی گەورەی ئاسمانیی (هەورە بروسکەو بوومەلەزە) گرتیو لەناو چوون وەك گەلی سەمود ﴿ومنهم من خسفنا به الأرض﴾ هەشیانبوو بەخۆی و سامان و دارایی‌یەوە وەك قارون بەناخی زەویدا ڕۆبرد ﴿ومنهم من اغرقنا﴾ هەیشیان بوو وەك گەلی نوح و فیرعەون و هامانی وەزیری و لەشکرەکەی لەئاودا نوقممان کردن ﴿وماکان الله لیظلمهم﴾ وەنەبێت خوا ستەمی لێکردبن، نا" خواستەمی لێنەکردن ﴿ولکن کانوا انفسهم یظلمون﴾ بەڵکوخۆیان ستەمیان لەخۆیان کرد, ئەوەبوو سەرپێچییان کردو, سەرەنجام سزا هاتە سەریان.

### دۆستگرتن ( غەیرەز خوا ) لە کاری کاکڵە مووشان دەچێ:

ئینجا خوای گەورە وێنەو مەسەل بۆ هاوبەشدانەرەکان دێنێتەوە سەبارەت بەوەی کە لەباتی خوا بت ئەپەرستن، ئەفەرموێ: ﴿[٤١]مثل الذین اتخذوا من دون الله اولیاء کمثل العنکبوت اتخذت بیتا﴾ مەسەل و نموونەی ئەو کەسانەی بێجگە لە خوا چەند دۆستێکیان بۆ خۆیان گرتووە، هەروەك مەسەلی(کاکڵەمووشان) جاڵجاڵۆکەیان بەسەرهاتووە کەخانوویەکی بۆخۆی تەنیوە ﴿وإن اوهن البیوت لبیت العنکبوت لو کانوا یعلمون﴾ ئاشکرایشە کەخانووی کاکڵەمووشان نابوودترین وسسترین خانووە ئەگەرئەوراستییە بزانن وتێبگەن ﴿إن الله یعلم مایدعون من دونه من شیء﴾ بەراستیی خوا دەزانێ چین ئەوانەی ئەوان هاوارو هانایان بۆدەبەن ﴿وهوالعزیز الحکیم﴾ هەرخۆیشی دەسەڵاتداری لەکارزانە ﴿[٤٢]وتلك الأمثال نضربها للناس﴾ ئەومەسەلانەش - کەناوبەناو- بۆخەڵکیان دەهێنینەوە هەربۆتێگەیشتنە ﴿ومایعقلها إلا العالمون﴾تێیان ناگەن ,تەنها زاناو وردبینەکان نەبێ ,واتە: هەر ئەوان تێیان دەگەن.

### قورئان بخوێنەو، پەیامەکەت بگەیەنە:

﴿[٤٤]خلق الله السموات والأرض بالحق﴾ خوا ئاسمانەکان وزەویی بەرەواو هەق بەدیهێناوە ﴿إن فی ذلك لآیة للمؤمنین﴾ بەڕاستیی لەو بەدیهینانەدا بەڵگەیەکی گەورە هەیە بۆبڕواداران ﴿[٤٥] اتل ما اوحی إلیك من الکتاب﴾ ئەی موحەممەد ﷺ ئەوی لەم قورئانەدا بۆت وەحی کراوە بیخوێنەوە ﴿واقم الصلاة﴾ و بەبەردەوامی و ڕێك وپێك نوێژیش ئەنجام بدە ﴿إن الصلاة تنهی عن الفحشاء والمنکر﴾ بەڕاستیی نوێژی " تێروتەسەل" بەرهەڵستی مرۆ لەکاری خراپ و ناپەسەند و گوناهو تاوان دەکات ﴿ولذکر الله اکبر﴾ وبێگومان یادی خوا -لەدونیادا- لە هەموو شتێك هێزاتروگەورەترە"، چونکە بیرکردنەوەیە لەگەورەیی ودەسەڵاتی خوا ﴿والله یعلم ما تصنعون﴾ خواش بەوکارو کردەوانەی ئێوە ئەنجامیان دەدەن، ئاگادارە, بۆخۆیشی پاداشتتان ئەداتەوە.

کۆتایی جزمی بیستەم

و لله الحمد والمنة

*** *** ***

**بە جوانترین شێوە لەگەڵ خاوەن نامەكاندا موجادەلە بكەن:**

دوای گفت و گۆو وتوێژێكی زۆر لەگەڵ هاوبەش دانەرەكاندا، دێتەسەر باسی ئەوانە كە بڕوایان بەخوا هەیەو خاوەن كتێبن، بەڵام گومانیان لەپەیامبەرێتی موحەممەدداﷺ هەیە، بۆیە ئەفەرموێ: ﴿[٤٦] ولا تجادلوا أهل الكتاب إلا بالتي هي احسن﴾ ئێوە لەگەڵ خاوەن نامەكاندا -جوولەكەوگاور- دەمەقاڵێ ومشت ومڕ مەكەن، بەتایبەتی ئەوانەیان دڵیان پێوەیە باوەڕ بێنن، مەگەر بەجوانترین شێوەو شێواز، واتە: زۆربەنەرمیی ولەسەر خۆ بەڵگەو دەلیلیان بۆبێننەوە ﴿إلا الذين ظلموا منهم﴾ ئەوانەیان نەبێ ستەمیان كرد بەسەركێشی وعینادی، ئەوە ئێوەش دەتوانن بەتوندو تیژیی وسەختگیرانە رەفتاریان لەگەڵ بكەن ﴿وقولوا آمنا بالذى انزل إلينا وانزل إليكم﴾ وە هەركاتێكیش باسیـنامەی ئاسمانیان كرد، ئێوە پێیان بڵێن: بڕوامان هەیە بەوقورئانەی كە بۆمان نێردراوە،وەبەو (تەورات) و(ئینجیل)ش بۆ ئێوە نێرراوە، واتە: نەبەدرۆیان بخەنەوەو، نە تەسدیقیشیان بكەن، ﴿وآلهنا وإلهكم واحد ونحن له مسلمون﴾ خوای ئێمەو، خوای ئێوە تەنها هەر یەكێكە و، ئێمەش بەتەنیا فەرمانبەرداروملكەچی ئەو زاتەین، هەر ئەمەش بووكاتێ كە(تەورات)یان دەخوێندەوەو بە زمانی موسڵمانەكان تەفسیریان دەكرد، پێغەمبەرﷺدەیفەرموو: ((لاتصدقوا أهل الكتاب ولا تكذبوهم، وقولوا آمنابالله وما انزل إلينا وما انزل إليكم، وإلهكم وإلهنا واحد، ونحن له مسلمون)) بوخاریی. ﴿[٤٧] وكذلك انزلنا إليك الكتاب﴾ جاهەر چۆنی- لەپێش تۆوە - كتێب و نامەمان دابەزاند، هەر ئاوایش ئەم كتێبەمان بۆ تۆ دابەزاند, واتە: ناردنی قورئان بۆ تۆ شتێكی نامۆنییە ﴿فالذين آتيناهم الكتاب يؤمنون به﴾ جا هەندێك لەوانە كەبەرلەم قورئانە نامەی ئاسمانیان پێدراون وەك (عەبدوڵلای كوڕی سەللام) بڕوای پێدێنن و موسڵمان دەبن ﴿ومن هؤلاء من يؤمن به﴾ وەلەوانەیش (مەككەییەكان) هەیانە بڕوای پێدێنێ وموسوڵمان دەبێ ﴿وما يجحد بآياتنا إلا الكافرون﴾ وە جگە لە كافران, كەسی ترنیە نكوڵی ئایەتەكانمان بكات

الجزء الحادي والعشرون — سورة العنكبوت

۞ وَلَا تُجَٰدِلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ إِلَّا
ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنۡهُمۡۖ وَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَأُنزِلَ
إِلَيۡكُمۡ وَإِلَٰهُنَا وَإِلَٰهُكُمۡ وَٰحِدٞ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ﴿٤٦﴾
وَكَذَٰلِكَ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَۚ فَٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ
يُؤۡمِنُونَ بِهِۦۖ وَمِنۡ هَٰٓؤُلَآءِ مَن يُؤۡمِنُ بِهِۦۚ وَمَا يَجۡحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ
إِلَّا ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿٤٧﴾ وَمَا كُنتَ تَتۡلُواْ مِن قَبۡلِهِۦ مِن كِتَٰبٖ
وَلَا تَخُطُّهُۥ بِيَمِينِكَۖ إِذٗا لَّٱرۡتَابَ ٱلۡمُبۡطِلُونَ ﴿٤٨﴾ بَلۡ هُوَ
ءَايَٰتُۢ بَيِّنَٰتٞ فِي صُدُورِ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَۚ وَمَا يَجۡحَدُ
بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٩﴾ وَقَالُواْ لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ
ءَايَٰتٞ مِّن رَّبِّهِۦۖ قُلۡ إِنَّمَا ٱلۡأٓيَٰتُ عِندَ ٱللَّهِ وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٞ
مُّبِينٌ ﴿٥٠﴾ أَوَلَمۡ يَكۡفِهِمۡ أَنَّآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ
يُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَرَحۡمَةٗ وَذِكۡرَىٰ لِقَوۡمٖ
يُؤۡمِنُونَ ﴿٥١﴾ قُلۡ كَفَىٰ بِٱللَّهِ بَيۡنِي وَبَيۡنَكُمۡ شَهِيدٗاۖ
يَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ
بِٱلۡبَٰطِلِ وَكَفَرُواْ بِٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴿٥٢﴾

٤٠٢ — وَيَسۡتَعۡجِلُونَكَ

**بەرلە هاتنی قورئان، تۆ نە دەتخوێندو نە دەتنووسی:**

﴿[٤٨] وما كنت تتلوا من قبله من كتاب﴾ هەرگیز لەپێش ناردنی ئەم قورئانەدا تۆ هیچ كتێبێكت نەخوێندۆتەوە ﴿ولا تخطه بيمينك﴾ و بەدەستی خۆیشت هیچ نامەو كتێبێكت نەنووسیوە ﴿إذا لارتاب المبطلون﴾ ئەگەر خوێندەوار بوویتایە ئەوددەمە ناهەق بێژەكان دەكەوتنە گومانەوە لە خۆت و لە قورئان واتە: ئەگەر خوێندەوار بوویتایە جێگەی قسەیان هەبوو، بەڵام ئێستا جێگەی هیچ قسەیەكیان نیە، چونكە چاكچاك ئەتناسن كە تۆ خوێندەوار نیت ونازانی بخوێنی و بنووسیت.﴿[٤٩] بل هو آيات بينات في صدور الذين اوتوا العلم﴾ بەڵكو

ئەوقورئانە چەن ئایەتێکی روون وئاشکراو پارێزراوە لەسینگ ودڵی ئەوکەسانەدا زانیاریان پێدراوە وەرگرتنی ﴿وما يجحد بآياتنا إلا الظالمون﴾ وە ستەمکاران نەبێت، کەسیکیٚتر نکولی لە ئایەتەکانی ئیمە نییە.

**موشریکان بیٚ لە قورئان، بەڵگەی تریان دەویٚ:**

دیارە ملهووڕەکانی قورەیش قورئانی پیرۆز بەبەڵگە دانانێن بۆ راستی پێغەمبەر ﷺ، بۆیە: ﴿[٥٠] وقالوا لولا انزل عليه آيات من ربه﴾ وتیان: جا بۆراستیی خۆی. بۆ لەلایەن پەوەردگاریەوە چەند بەڵگەیەکی بۆ دانەبەزێنرا وەکو وشترەکەی (صالح)، داردەستەکەی (مووسا)..؟ ﴿قل إنما الآيات عندالله﴾ تۆش پێیان بڵێ: هەموو بەڵگەو نیشانەکان هەرلایخوان وبەدەستی ئەون، من هیچ شتێکم بەدەست نیە ﴿وإنما انا نذير مبين﴾ ومن هەر بیدارکەرەوەو ترسێنەرێکی ئاشکرام ﴿اولم يكفهم انا انزلنا عليك الكتاب يتلى عليهم﴾ مەگەر ئەوانە داوای بەڵگە ئەکەن، ئەوەیان بەس نیە کە ئیمە قورئانمان بۆ ناردویت و بەسەریاندا ئەخوینرێتەوە؟ تابیکەنە بەڵگە بۆ راستی تۆ؟ ﴿إن في ذلك لرحمة وذكرى لقوم يؤمنون﴾ بەراستیی لەوقورئانەدا بەزەیی و ئامۆژگاری هەیە، بۆ هەر قەوم وهۆزی بیانەویٚ باوەڕ بێنن. جادوای بڕوا نەهێنان پێیدەفەرمویٚ: ﴿[٥٢] قل كفى بالله بيني وبينكم شهيدا﴾ کە پێیان بڵێ: خوا بەسە شایەت بێت لەنیوان ئێمەو ئێوەدا لە سەر پێغەمبەرایەتیم ﴿يعلم مافي السموات والأرض﴾ ئەو خوایە کە دەزانیٚ چی لە ئاسمانەکان وزەویدایە ﴿والذين آمنوا بالباطل وكفروا بالله﴾ وئەوانەش بڕوایان بەناهەق (پەرسراوی تر) هەیە حاشایان لەخوا کرد! ﴿اولئك هم الخاسرون﴾ ئەوانەن -لەدونیاو لەقیامەتدا- زیانیان لەخۆداوە. ﴿[٥٣] ويستعجلونك بالعذاب﴾ ئەو بیٚباوەڕانە پەلەی هاتنی سزات لیٚ دەکەن! ﴿و لولا اجل مسمى لجاءهم العذاب﴾ ئەگەر ماوەی دیاریکراومان بڕیار نەدابا بۆ سزادانیان ئەوا سزاکەیان بۆ دەهات ﴿و ليأتينهم بغتة وهم لا يشعرون﴾ بیگومانبە ئەو سزاو تۆڵەیە هەر کتوپڕ بۆیان دیٚ و بەخۆیشیان نازانن ﴿[٥٤] يستعجلونك بالعذاب﴾ ئەوانە هەر پەلەیانەو بە لەز داوای سزات لیٚ ئەکەن! ﴿وان جهنم لمحيطة بالكافرين﴾ خۆ ئەوانە پەلە بکەن، یا نەیکەن دۆزەخ دەوری کافران دەدا ﴿[٥٥] يوم يغشاهم العذاب من فوقهم ومن تحت ارجلهم﴾ رۆژی سزاکە دایان دەگرێت لەبانی سەریانەوەو، لەژێر پێیانەوەو ولە هەموو لایەکەوە ﴿ويقول ذوقوا ما كنتم تعملون﴾ خوا پێیان ئەفەرمویٚ: دە بچێژن ئاکام و پاداشی ئەو کردەوانەی دەتان کردن.

الجزء الحادي والعشرون | سورة العنكبوت

وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِالْعَذَابِ وَلَوْلَا أَجَلٌ مُّسَمًّى لَّجَاءَهُمُ الْعَذَابُ
وَلَيَأْتِيَنَّهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ٥٣ يَسْتَعْجِلُونَكَ بِالْعَذَابِ
وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌ بِالْكَافِرِينَ ٥٤ يَوْمَ يَغْشَاهُمُ الْعَذَابُ
مِن فَوْقِهِمْ وَمِن تَحْتِ أَرْجُلِهِمْ وَيَقُولُ ذُوقُوا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ
٥٥ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ أَرْضِي وَاسِعَةٌ فَإِيَّايَ فَاعْبُدُونِ
٥٦ كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ ثُمَّ إِلَيْنَا تُرْجَعُونَ ٥٧ وَالَّذِينَ
آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَنُبَوِّئَنَّهُم مِّنَ الْجَنَّةِ غُرَفًا تَجْرِي
مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا نِعْمَ أَجْرُ الْعَامِلِينَ ٥٨ الَّذِينَ
صَبَرُوا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ٥٩ وَكَأَيِّن مِّن دَابَّةٍ لَّا تَحْمِلُ
رِزْقَهَا اللَّهُ يَرْزُقُهَا وَإِيَّاكُمْ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ٦٠ وَلَئِن
سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ
لَيَقُولُنَّ اللَّهُ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ٦١ اللَّهُ يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَن يَشَاءُ مِنْ
عِبَادِهِ وَيَقْدِرُ لَهُ إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ٦٢ وَلَئِن سَأَلْتَهُم
مَّن نَّزَّلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَحْيَا بِهِ الْأَرْضَ مِن بَعْدِ مَوْتِهَا
لَيَقُولُنَّ اللَّهُ قُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ٦٣

٤٠٣

**كۆچ بكەن و، لەڕۆزیی مەترسن:**

﴿٥٦ یا عبادی الذین آمنوا إن أرضی واسعة﴾ ئەو بەندانەم بڕواتان هێناوە بەڕاستی زەویی من پان و فروانە، ئەگەر لە (مەككە)ئەزیەت دەكرێن، دەسا كۆچ بكەن و بچنە (مەدینە) وە یان بۆ هەرجێگایەكی تر، ئیتر بۆهەر لەمەككە دانیشتوون و قبووڵی ئەو گش ئازارو بێزارە دەكەن؟ ﴿فإیای فاعبدون﴾ سا ئەگەر نەتاندەتوانی لە جێگەی بە ئازادانە پەرەستش بكەن بگوێزنەوە بۆ جێگەیەكی تر سا هەر لەوێ پەرەستشی من بكەن بۆیە موسڵمانەكانی مەككەش -كاتێ بەنیان توند كرایەوە لەلای قورەیشەوە- بەرەو دەڤەری (حەبەشە) ناوی خوایان لێهێناو باریانكرد ﴿٥٧ كل نفس ذائقة الموت﴾ خۆ هەموو خاوەن گیانێك چێژەری مەرگە، واتە: هەمووتان مەرگ دەچێژن ﴿ثم إلینا ترجعون﴾ پاشانیش بۆلای ئێمە دەگێردرێنەوە، جا ئیتر بۆ كۆچ ناكەن؟ ﴿٥٨ و الذین آمنوا و عملوا الصالحات﴾ ئەوانەی وا بڕوایان هێناوەو، كارە چاكەكانیان كردووە ﴿لنبوانهم من الجنة غرفا﴾ بێگومان لەچەند كۆشك و تەلارو جیگایەكی زۆربەرزو بڵوندی بەهەشتدا نیشتەجێیان ئەكەین ﴿تجری من تحتها الأنهار خالدین فیها﴾ چەندان جۆگەو ڕووبارو تاڤگە بەژێر دارو درەختەكانیدا دێن و دەچن و بەهەتا هەتاییش تێیدان ﴿نعم اجر العاملین﴾ پاداشی كردەوەكەران و كۆششكاران، ئەوانە وا بۆ خوا كار دەكەن چەندە چاكە! ﴿٥٩ الذین صبروا وعلی ربهم یتوكلون﴾ ئەوانەی كەهەمیشە ئارامیان دەگرت وپشتیان تەنیا هەربە پەروەردگاریان دەبەست، لەهەموو ئیش و كارێكا ﴿٦٠ و كأین من دابة لا تحمل رزقها﴾ ئێوە جیهاد بكەن ئەی موسڵمانان! هەرگیز لەهەژاریی و گیرو گرفتی ڕۆزیی مەترسن، چون خزۆك وجوڵندەیەكی زۆر هەن، هیچیان ڕسق و ڕۆزییان نەداوە بەكۆڵی خۆیاندا، كەچی ﴿الله یرزقها وإیاكم﴾ هەر خوا ڕزق و ڕۆزی، ئەوانیش و ئێوەش ئەدا، دەستە بەری ڕۆزی هەموانە، جاكەواتە هەركات كۆچتان كردو، جیهاد هاتە پێش لە ژیان مەترسن ﴿وهو السمیع العلیم﴾ ئەویشە ژنەوای زانا، واتە: ژنەوا بۆ هەموو شتێك و ئەم بەهەموو شتێك و ناختان.

**خوا یەكەو نابێ بە دوو:**

﴿٦١ ولئن سألتهم من خلق السماوات والأرض وسخر الشمس والقمر﴾ ئەگەر لەو بێ باوەڕانە بپرسیت: كێ ئاسمانەكان و زەویی دروستكردووە و، خۆرو مانگی رامكردەووە" ئابەو شێوەیە بە ئاسانی بێن و بچن ﴿لیقولن الله﴾ بێ سێ و دوو دەڵێن: هەر خوایە ئەوكارانەی كردووە ﴿فأنی یؤفكون﴾ دەسا ئیتر چۆن لە یەك خوا پەرستیی لادەدرێن و بەرەو بتپەرستی ئەبرێن! ﴿٦٢ الله یبسط الرزق لمن یشاء من عباده و یقدر له﴾ هەر خوایە ڕزق و ڕۆزی فرە دەبەخشێ بۆ هەر كەسێك كە خۆی بییەوێ لەبەندەكانی، وە یان كەمی دەكاتەوە بۆی ﴿إن الله بكل شئ علیم﴾ بەڕاستی خوا بەهەموو شتێ زانایە ﴿ولئن سألتهم من نزل من السماء ماء﴾ ئەگەر لێیشت پرسیبان: كێ لە ئاسمانەوە بارانی باراند ﴿فأحیا به الأرض بعد موتها﴾ و زەویی لەپاش مردنی پێ بووژاندەوە ﴿لیقولن الله﴾ دیسان هەر بێ سێ ودوو لە وەڵامدا ئەڵێن: هەرخوایە ئەو كارە دەكا! ﴿قل الحمد لله بل اكثرهم لأیعقلون﴾ دەسا تۆش بڵێ: سوپاس هەر بۆ ئەو خوایە، كەئێوە دان بەتواناییدا دەنێن، بەڵام زۆربەیان تێناگەن و، دەكەونە چ (تناقض)ێكەوە، ژیرییان ناخەنەكار ﴿٦٤ وما هذه الحیاة الدنیا إلا لهو ولعب﴾ بێگومان ژیانی ئەم دنیایە جگە لەسەر گەرمیی و گاڵتەوگەپ شتێكیتر نیە، بۆیە دەبێ ئەوەندە هەوڵی بۆ نەدرێت! ﴿وإن الدار الآخرة لهی الحیوان﴾ چونكە بێگومانە هەرماڵی قیامەت و ژیانی ئەوێ زیندەگیی وژیانە ﴿لوكانوا یعلمون﴾ ئەگەر ئەو خەڵكە بیانزانیبا ئاوایە، ژیانی دنیایان هەڵ نەدەبژارد بەسەر ئاخیرەتدا ﴿٦٥ فإذا ركبوا فی الفلك دعوا الله مخلصین له الدین فلما

نجاهم إلى البر إذاهم يشركون﴾ لەکاتی خۆشیی و ئاسایشدا دەبینی ئەو خەڵکەیە بێ باوەڕن و نکوڵیی قیامەت دەکەن، کەچی کاتێ سواری کەشتی ئەبن و ترسی نقوم بوونیان لێ دەنیشێت زۆر بەکوڵ سەر دائەنێن و ملکەچیی و یەکلابوونەوەی خۆیان بۆ خوا دەرئەبڕن و تەنها لەو داوا ئەکەن و، باسی بتەکان نامێنێ، بەڵام کاتێ ڕزگاریان دەکاو دەگەنە وشکانیی، دووبارە دەچنەوە سەر بیرە پووچەڵەکەی خۆیان و بەهەمان جۆر شەریك و هاوەڵ بۆ خوا دادەنێن. لە سوورەتی (١٧/٦٧-٦٩)، وە لە هەندێ سوورەتی تریشدا هەر ئەوماناو مەبەستەیە هاتووە. ﴿٦٦ ليكفروا بما آتيناهم وليتمتعوا﴾ دەبا ئەوانە هەر نکووڵی ئەو نیعمەتانەمان بکەن پێمان بەخشیون، دەبا چەند ڕۆژێکی کەم لەم ژیانە لەزەت و خۆشی ببەن ﴿فسوف يعلمون﴾ جا لە ئاییندەدا ئەزانن ئەنجامی بێ باوەڕیی و هاوبەشدانان بۆ خوا بەکوێ ئەگات؟.

الجزء الحادي والعشرون | سورة العنكبوت

وَمَا هَٰذِهِ الْحَيَوٰةُ الدُّنْيَا إِلَّا لَهْوٌ وَلَعِبٌ وَإِنَّ الدَّارَ الْآخِرَةَ
لَهِيَ الْحَيَوَانُ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ ﴿٦٤﴾ فَإِذَا رَكِبُوا فِي
الْفُلْكِ دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ فَلَمَّا نَجَّىٰهُمْ إِلَى الْبَرِّ إِذَا
هُمْ يُشْرِكُونَ ﴿٦٥﴾ لِيَكْفُرُوا بِمَا آتَيْنَاهُمْ وَلِيَتَمَتَّعُوا فَسَوْفَ
يَعْلَمُونَ ﴿٦٦﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا جَعَلْنَا حَرَمًا آمِنًا وَيُتَخَطَّفُ
النَّاسُ مِنْ حَوْلِهِمْ أَفَبِالْبَاطِلِ يُؤْمِنُونَ وَبِنِعْمَةِ اللَّهِ يَكْفُرُونَ
﴿٦٧﴾ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَىٰ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِالْحَقِّ
لَمَّا جَاءَهُ أَلَيْسَ فِي جَهَنَّمَ مَثْوًى لِلْكَافِرِينَ ﴿٦٨﴾ وَالَّذِينَ
جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا وَإِنَّ اللَّهَ لَمَعَ الْمُحْسِنِينَ ﴿٦٩﴾

سُورَةُ الرُّومِ

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

الم ﴿١﴾ غُلِبَتِ الرُّومُ ﴿٢﴾ فِي أَدْنَى الْأَرْضِ وَهُمْ مِنْ بَعْدِ
غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ ﴿٣﴾ فِي بِضْعِ سِنِينَ لِلَّهِ الْأَمْرُ
مِنْ قَبْلُ وَمِنْ بَعْدُ وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ الْمُؤْمِنُونَ ﴿٤﴾
بِنَصْرِ اللَّهِ يَنْصُرُ مَنْ يَشَاءُ وَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ ﴿٥﴾

وَعْدَ اللَّهِ ٤٠٤

**دەبێ لە هێمنی مەککە پەند بگرن:**

﴿٦٧ أولم يروا أنا جعلنا حرما آمنا﴾ ئاخۆ ئەوانە نابینن ئێمە مەککەمان کردۆتە قەدەغەو جێگایەکی ئارام و ئاسایش؟ نابینن پیاوکوشتن و دزیی ودرۆزنی تێدا یاساغە ﴿ويتخطف الناس من حولهم﴾ وە لە دەوری ئەواندا، واتە: لەدەرەوەی (حەرەم) دا خەڵك ئەفڕێندرێ و تالان دەکرێ؟. بۆئەم مانایە سەیری سوورەتی (٢٨/٥٧و، سوورەتی(٣/٩٧)و سوورەتی (٥/٦٧)و، سوورەتی (٤/٣/١٠٦) بکە. ﴿افبالباطل يؤمنون وبنعمة الله يكفرون﴾ ئایا بە شتی پووچ، واتە: بتەکان باوەڕ دەکەن و، بە نیعمەت و بەخششی کافر دەبن؟! ﴿٦٨ ومن اظلم ممن افترى على الله كذبا﴾ کێ لەوکەسە ستەمکارترە کە لە سەر خوا درۆ هەڵبەسێ وهاوبەش و هاوەڵی بۆ دادەنێ؟ ﴿أو كذب بالحق لما جاءه﴾ یان باوەڕی بەو قورئانە هەقە نەبێت کاتێ بۆی هات؟ ﴿اليس في جهنم مثوى للكافرين﴾ ئاخۆ بۆ بێ بڕوایان لە دۆزەخدا جێ نیە؟! واتە: جێ هەیە لە دۆزەخدا بۆیان ﴿٦٩ والذين جاهدوا فينا لنهدينهم سبلنا﴾ وەئەوانەش لەپێناوی ڕەزامەندی ئێمەدا هەوڵ و کۆشش و جیهادیان کرد، ئەوە بێگومان ئێمەش ئەوان ڕێنمایی دەکەین بۆ ڕێگاکانی بەهەشت و گەیشتنیان بە ئێمە، بەڵێ هەر ئەم مەبەستە لەچەند ئایەتێکی تردا ڕوون کراوەتەوە، وەك سوورەتی (٤٧/١٧)و سوورەتی (٩/١٢٤). ﴿وإن الله لمع المحسنين﴾ بەڕاستی خوا بەردەوام لەگەڵ چاکەکاراندایە، واتە: لە گەڵ ئەوانەدایە کەبەڕاستیی جیهاد دەکەن، بەیاریدەدان وسەرخستن. لەسوورەتی (١٦/١٢٦)دا پتر ئەم ڕاستییە ڕۆشن کراوەتەوە.

کۆتایی تەفسیری سوورەتی (عەنکەبووت) هات لەگەڵ سوپاسی بێ شایستەدا بۆ خوای کارجوان وکارزان.

*** *** ***

٣٠- سوورەتی ( رووم )ـە

مەككەییەو ( ٦٠ ) ئایەتە

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

سەرەتای ئەم سوورەتە هەواڵی سەركەوتنی ڕۆمەكان بەسەر فارسەكاندا- بەزەمانێك پێش ڕوودانی- ڕادەگەیەنێ، جا پاش ماوەیەك قورئان چۆنی ڕایگەیاندبوو ئاواڕوویدا، دیارەئەمەیش گەورەترین بەڵگەیە بۆ ڕاستیی پەیامبەر ﷺ, پاشان ئەم بنەمایە ئەخاتە ڕووكە: تا كۆتایی دنیا لەنێوان شەیتاندا بەردەوام دەبێت، ئینجا كورتەباسێكی قیامەت ئەكات، كۆتاییشی بەوەدێت كە: هیچ ئایەت وترسێنەرێك سوود بەقوڕەیش نابەخشێت.

ڕۆمییەكان، پاش شكان، سەردەكەونەوە:

﴿بسم الله الرحمن الرحيم * ¹ الم﴾ ئەم پیتانە هێماو ئاماژەن بۆ(تەحەددی)و دەستەوسانی عەرەبەكان بەرامبەر بەقورئان ودەرەنجامیش پەككەوتنیان وهیچ لێنەهاتنیان ﴿² غلبت الروم * ³ فى أدنى الأرض﴾ ڕۆمەكان بەدەستی فارسەكان تێكشكان لەبەشێكی زۆرنزیك بە وڵاتی عەرەبەكانەوە كەدەكەوێتە نێوان (ئوردن و فەلەستین) ,ئەوەش لەساڵی (٦١٣-٦١٤)ز, لەسەردەمی (یزدجورد), -ئاخرپاشای فارسەكان-بوو, هەرئەو یەزدجوردەشبوو نامەكەی پێغەمبەری ﷺ دڕاند، كاتێ كەبانگی كردبۆ ئیسلامبوون، پاشان پێغەمبەریش نزای شەڕی لێكرد، تا لەسەردەمی ئیمامی عوسماندا كوژرا ﴿وهم من بعد غلبهم سيغلبون﴾ و ئەوانیش (ڕۆمەكان) پاش زاڵبوونی فارسەكان بەسەریاندا زاڵ ئەبنەوە.

ڕاڤەكەرانی قورئان ئەڵێن: لەنێوان فارس و ڕۆمەكاندا جەنگێك هەڵگیرسا، ئینجا فارسەكان بەسەرڕۆمەكاندا زاڵبوون، پەیامبەر ﷺ خۆی و هاوەڵانی گەلێ پێیان سەخڵەت وقورس بوو! لەولایشەوە موشریكەكان زۆر خۆشحاڵ ودڵشاد بوون، چونكە موشریكەكان بە موسڵمانەكانیان گوت: ئێوەیش وەك ڕۆمەكان تێكدەشكێن وئێمە زاڵ ئەبین بەسەرتانا.. پێشەوا (ئەبوبەكر) فەرمووی: دەك نەیبینن ﴿⁴ فى بضع سنين﴾ لە چەند ساڵێكدا, واتە: لەنێوان(٣-٩) ساڵدا, ڕۆمەكان بەسەرفارسەكاندا زاڵ ئەبنەوە، بەڵێ وابوو دوای حەوت ساڵ ئەنجامەكە وادەرچوووفارسەكان تێكشكان. ئەمەیش گەورەترین بەڵگەیە بۆڕاستیی پەیامبەروقورئان، دەتوانی سەیرێكی تەفسیری (ئیبن كەسیر) بكەیت. ﴿لله الأمرمن قبل ومن بعد﴾ هەمووكارو بڕیارو دەسەڵاتێك پێش زاڵبوون وپاش زاڵبوون هەربۆ خوایە. ﴿ويومئذ يفرح المؤمنون* ⁵ بنصر الله﴾ ئیتر لەوڕۆژەدا كە ڕۆم بەسەر فارسدا زاڵ ئەبێتەوە,باوەڕدارەكان خۆشحاڵ ئەبن بەوسەرخستن ویارمەتی خوایەو بەتێكشكانی فارسەكانیش زۆر خۆشحاڵ دەبن، چونكە ئەوانیش وەك موشریكەكان بێ كتێب وبێ نامەن ﴿وينصر من يشاء﴾ دیارە هەركەسێك خوا خۆی بییەوێ یارمەتی ئەداو سەریدەخات ﴿وهو العزيز الرحيم﴾ هەر ئەویشە خاوەن دەسەڵاتداری دلۆڤان ﴿⁶ وعد الله لا يخلف الله وعده﴾ زاڵبوونی ڕۆمەكان بەسەر فارسەكا ندا بەڵێنی خوایە, هەرگیزیش خواپێچەوانەی بەڵێنی خۆی ناكا ﴿ولكن اكثر الناس لا يعلمون﴾ بەڵام زۆربەی خەڵكی ئەوە نازانن ﴿⁷ يعلمون ظاهرا من الحياة الدنيا﴾ ڕووكەشێك لە ژیانی ئەم دنیا ئەزانن: پیشەسازیی وتەكنەلۆژیاو دروستكردنی گەلێك لە هۆكاری ئاسانكاری بۆ ژیان ﴿وهم عن الأخرة هم غافلون﴾ كەچی لە ئاخیرەت بێ ئاگاوغافڵن!

**له رووی ئەم شتانەوە خوا بناسە:**

﴿٨ اولم يتفكروا فى انفسهم﴾ ئەوانەكە نكووڵی زيندووبونەوە دەكەن! ئاخۆ بيريان لەخۆيان نەكردۆتەوە,چۆن دروستكراون؟ ديارە هەرئەودروستكەرە كە دروستی كردوون, دەشتوانێ زيندوويان بكاتەوە ﴿ماخلق الله السموات والأرض وما بينهما إلا بالحق واجل مسمى﴾ خوا ئاسمانەكان وزەويی وئەوەی لەنێوانيانداية دروست نەكردووە بەهەق وعەدل و ماوەيەكی دياريكراو نەبێ، واتە: هەربەعەدل و لەماوەيەكی دياريكراويشدا كۆتاييیان دێ وقيامەت بەرپا ئەبێ ﴿وإن كثيرا من الناس بلقاء ربهم لكافرون﴾ كەچی زۆرێك لەم خەڵكە بەگەيشتنی ديداری پەروەردگاريان وزيندووبوونەوە بێ باوەڕن ﴿٩ اولم يسيروا فى الأرض فينظروا كيف كان عاقبة الذين من قبلهم﴾ ئاياگوزەريان بەسەرئەم زەوييەدا نەكردووە؟ ببينن وبزانن ئەنجامی ئەوانەی لەپێشيانەوە بوونە چۆن بووە؟ ئەوە بوو هەر كەسەرپێچييان كرد، خواش لەناوی بردن ﴿كانوا اشد منهم قوة﴾ خۆ لەمانەش بەهێزترو بەتواناتر بوون ﴿وأثاروا الأرض وعمروها أكثرمما عمروها﴾ زەوييان ژێرەوژوور كردو هەڵگێڕايەوە بۆكشتوكاڵ وشتی تر, وەئاوەدانيان دەكردەوە،زياتر لەوەی ئەمان ئاوەدانيان كردەوە ﴿وجاءتهم رسلهم بالبينات﴾ پەيامبەرەكانيشيان بەگەلێ بەڵگەو نيشانەی ئاشكراوە بۆ هاتن, كەچی هەر باوەڕيان پێنەكردن ﴿فما كان الله ليظلمهم﴾ جا كاتێ خوا لەناوی بردن، وەنەبێ ستەمی لێكردبن, نا، هەرگيز خوا ستەمی لێ نەكردن، ﴿ولكن كانوا انفسهم يظلمون﴾ بەڵكو خۆيان ستەميان لەخۆيانكردو بڕوايان نەهێناو پەيامبەرەكانيان بەدرۆزن دانا ﴿١٠ ثم كان عاقبة الذين اساؤا السواى﴾ پاشان ئەنجامیئەوانەی گوناهو تاوانيان كرد، خراپترين پاشەڕۆژ بوو، چونكە لەدنيادا گەيشتنە پلەيەك: ﴿ان كذبوا بآيات الله وكانوا بها يستهزئون﴾ كە ئايەتەكانی خوايان بەدرۆ زانی وگاڵتەيان پێ ئەكردن ﴿١١ الله يبدؤا الخلق ثم يعيده﴾ خوا خۆی ئەو خەڵكەدروسدەكاو, دواجاريش دەيهێنێتەوە گۆڕێ وبەتەنياو بێهاوەڵ ويارمەتيدەر﴿ثم إليه ترجعون﴾ ديسان هەربۆلای ئەويش دەگێڕدرێنەوە ﴿١٢ ويوم تقوم الساعة يبلس المجرمون﴾ كە كە ڕۆژی قيامەت هەڵدەستێ,تاونكاران بێ هيوادەبن و، فزەيان لێوەنايە وكڕوكپ دەكەون. ﴿١٣ ولم يكن لهم من شركائهم شفعاء﴾ كەسيشيان دەستناكەوێت لەوانەی بە شەريك وهاوبەشيان دادەنان بۆخوا تكايان بۆبكەن ﴿وكانوا بشركائهم كافرين﴾ نكووڵی لەو بتانەشيان ئەكەن كردبونيانە هاوبەشی خوا! ﴿١٤ ويوم تقوم الساعة يومئذ يتفرقون﴾ ڕۆژێكيش كەقيامەت بەرپادەبێت، ئەو ڕۆژە خەڵك لەيەك جيا ئەبنەوەدەبنە دوودەستە: موسڵمان وبێباوەڕ ﴿١٥ فأما الذين آمنوا وعطوا الصالحات﴾ جائەوانەی بڕوايان هێناوەوكارە چاكەكانيان كردووە ﴿فهم فى روضة يحبرون﴾ لە ناو باخچە وگوڵزاریبەهەشتدا ڕێز دەگیرێن ﴿١٦ واما

الجزء الحادي والعشرون — سورة الروم

وَعۡدَ ٱللَّهِۖ لَا يُخۡلِفُ ٱللَّهُ وَعۡدَهُۥ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ٦
يَعۡلَمُونَ ظَٰهِرٗا مِّنَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَهُمۡ عَنِ ٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ غَٰفِلُونَ ٧
أَوَلَمۡ يَتَفَكَّرُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۗ مَّا خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ
وَمَا بَيۡنَهُمَآ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَأَجَلٖ مُّسَمّٗىۗ وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِ
بِلِقَآيِٕ رَبِّهِمۡ لَكَٰفِرُونَ ٨ أَوَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرُواْ
كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ كَانُوٓاْ أَشَدَّ مِنۡهُمۡ قُوَّةٗ
وَأَثَارُواْ ٱلۡأَرۡضَ وَعَمَرُوهَآ أَكۡثَرَ مِمَّا عَمَرُوهَا وَجَآءَتۡهُمۡ
رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِۖ فَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظۡلِمَهُمۡ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ
أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ٩ ثُمَّ كَانَ عَٰقِبَةَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔواْ ٱلسُّوٓأَىٰٓ
أَن كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَكَانُواْ بِهَا يَسۡتَهۡزِءُونَ ١٠ ٱللَّهُ
يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ثُمَّ إِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ١١ وَيَوۡمَ تَقُومُ
ٱلسَّاعَةُ يُبۡلِسُ ٱلۡمُجۡرِمُونَ ١٢ وَلَمۡ يَكُن لَّهُم مِّن شُرَكَآئِهِمۡ
شُفَعَٰٓؤُاْ وَكَانُواْ بِشُرَكَآئِهِمۡ كَٰفِرِينَ ١٣ وَيَوۡمَ
تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يَوۡمَئِذٖ يَتَفَرَّقُونَ ١٤ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ
وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَهُمۡ فِي رَوۡضَةٖ يُحۡبَرُونَ ١٥

٤٠٥

﴿الذين كفروا وكذبوا بآياتنا ولقاء الآخرة﴾ ئەوانەش کافرو بێ بڕوا بوون ,ئایەتەکانمان و گەیشتن بەڕۆژی قیامەت بەدرۆیان دەزانی ﴿فأولئك فی العذاب محضرون﴾ ئەوانە لەناو ئازاروسزادا ئامادەکراون وبزرنابن, بەهەتاهەتاییش لەوێ ئەمێننەوە.

## پێنج فەرزە نوێژ بکەن:

﴿[17] فسبحان الله حين تمسون وحين تصبحون﴾ کاتێ ئەوەتان زانی، سا خوا بەپاك وبڵند ڕابگرن کاتێ ئێوارە دەکەنەوە، وە کاتێ بەیانی دەکەنەوە، واتە: نوێژەکانی مەغریب و عیشاو بەیانیتان بکەن ﴿[18] و له الحمد فی السموات والأرض وعيشا و حين تظهرون﴾ و سوپاس و ستاییش هەر بۆ خوایە لەتەواوی ئاسمانەکان و زەوییدا، سا خوا بەخاوێن ڕا بگرن ﴿[19] يخرج الحی من الميت ويخرج الميت من الحی﴾ ئەو خوایەیە زیندوو لەمردوو باڵندە لە هێلکە دەردێنێ، مردووش لەزیندوو هێلکە لە باڵندە دەردەخات ﴿ويحی الأرض بعد موتها﴾ زەویش دوای مردنیی و وشك بوونی گیانی تێدەخاتەوە، بەدەرهێنانی گیاو ڕووەکی ﴿وكذلك تخرجون﴾ ئێوەش هەرئاوا زیندوو ئەکرێنەوە لەگۆڕ دەردەهێنرێن.

وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَلِقَآيِٕ ٱلْأَخِرَةِ فَأُوْلَٰٓئِكَ فِي ٱلْعَذَابِ مُحْضَرُونَ ﴿١٦﴾ فَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ حِينَ تُمْسُونَ وَحِينَ تُصْبِحُونَ ﴿١٧﴾ وَلَهُ ٱلْحَمْدُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَعَشِيًّا وَحِينَ تُظْهِرُونَ ﴿١٨﴾ يُخْرِجُ ٱلْحَيَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَيِّ وَيُحْيِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَكَذَٰلِكَ تُخْرَجُونَ ﴿١٩﴾ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ إِذَآ أَنتُم بَشَرٌ تَنتَشِرُونَ ﴿٢٠﴾ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓاْ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأَيَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦ خَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَٰنِكُمْ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأَيَٰتٍ لِّلْعَٰلِمِينَ ﴿٢٢﴾ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦ مَنَامُكُم بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَٱبْتِغَآؤُكُم مِّن فَضْلِهِۦٓ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأَيَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَسْمَعُونَ ﴿٢٣﴾ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦ يُرِيكُمُ ٱلْبَرْقَ خَوْفًا وَطَمَعًا وَيُنَزِّلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَيُحْيِۦ بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَآ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأَيَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٢٤﴾

## نیشانە گەلێکی خوا:

﴿[20] ومن آياته أن خلقكم من تراب﴾ لەنیشانەکانی بوون و دەسەڵاتی ئەوەیە کەئێوەی (باوکە گەورەمان ئادەم) لەگڵ دروستکرد ﴿ثم إذا أنتم بشر تنتشرون﴾ پاشان ئێوە پلەبەپلە دەبن بە مرۆو لەسەرزەوییدا بلاو دەبنەوە ﴿[21] و من آياته أن خلق لكم من أنفسكم أزواجا﴾ لەنیشانەکانی بوون و دەسەڵاتی ئەوەیەکە: لە جنسی خۆتان، واتە: لە ڕەگەزی ئادەمزاد هاوسەری بۆ دروستکردن ﴿لتسكنوا إليها﴾ تالە پاڵیاندا بحەسێنەوە ﴿وجعل بينكم مودة ورحمة﴾ وخۆشویستیی و میهرەبانیشی خستۆتە نێوانتان بۆئەوەی بتوانن پێکەوە باری گرانی ژیان هەڵگرن ودرێژە بەژیان بدەن ﴿إن فی ذلك لآيات لقوم يتفكرون﴾ بێگومان ئالەوەدا گەلێ بەڵگە ونیشانە هەیە بۆ کەسانێ بەوردی تێفکرێن و، بەجوانی بیری لێبکەنەوە چونکە خوا لەلەش وجەستەی هەردووکیاندا ئەوەندەی دورستکردووە کەهەردوو بەیەکتر رازیی بن و، وەڵامی داخوازییەکانی یەکتر بدەنەوە بەوپەڕی سۆزو میهرەبانیەوە ﴿[22] ومن آياته خلق المسوات والأرض واختلاف ألسنتكم وألوانكم﴾ لە نیشانەکانی بوون و دەسەڵاتی خوا: دروستکردنی ئاسمانەکان و زەویی و لێکنەچوونی زمانی قسەکردن و ڕەنگەکانتانە ﴿إن فی ذلك لآيات للعالمين﴾ بەڕاستیی لەوەشدا چەند نیشانەی گەورە ومەزن هەیە بۆ زانایان، چونکە هەر ئەوان لێیان دەگەن، وەکو لە جێگایەکی تردا دەفەرموێ: (و ما يعقلها إلا العالمون) ﴿[23] ومن آياته منامكم بالليل والنهار وابتغاؤكم من فضله﴾ هەرلەنیشانەکانی بوون و توانایی ئەوەخەوی شەوانەو ڕۆژانەتان و هەوڵ و تێکۆشانتان بۆ

ڕزق و ڕۆزیی لەکاتی بێداریدا ﴿إن فی ذلك لآیات لقوم یسمعون﴾ بێگومان لەوەدا چەند نیشانەی گەورە و گرنگ هەیە بۆگەلێ ببیسن وئامۆژگاری وەرگرن ﴿٢٤ ومن آیاته یریکم البرق خوفا وطمعا﴾ یەکێ تر لە نیشانەکانی: بریسکەو چەخماخەتان نیشان ئەدات، کەهەم هۆی ترسە لەمردن، هەم هۆی ئومێدو هیوایە بۆباران ﴿وینزل من السماء ماء فیحیی به الأرض بعد موتها﴾ و لەئاسمانیشەوە ئاوێکتان بۆ دەبارێنێ زەویی پاش مردنیی و، وشکبوونیی و، نەمانی هێزی ڕواندنی ببووژێنێتەوە ﴿إن فی ذلك لآیات لقوم یعقلون﴾ بەڕاستیی لەوەدا بەڵگەونیشانە زۆرن بۆکەسانێ ئەقڵی خۆیان دەخەنەکار ﴿٢٥ ومن آیاته ان تقوم السماء والأرض بأمره﴾ هەر لەنیشانەکانی بوون و دەسەڵاتی ئەوەکە ئەم ئاسمان و زەوییە بەفەرمانی ئەو وەستاون ﴿ثم إذا دعاکم دعوة من الأرض إذا انتم تخرجون﴾ پاشان لەڕۆژی قیامەتدا هەریەکجار هەرایەکتان لێبکا ئێوە لەناکاو زیندوو ئەبنەوە و لەگۆڕ دێنە دەرێ ﴿٢٦ وله من فی السموات والأرض﴾ وە بۆ ئەو خوایە ئەوەی وا لەئاسمانەکان و زەویدایە، واتە: بە دروستکردن و بە موڵك هەر بۆخوایە ئەوەی وا تیایاندا ﴿کل له قانتون﴾ هەمووشیان بۆئەو ملکەچ و خۆبەکەمزان و فەرمان بەردارن ﴿٢٧ و هوالذی یبدأ الخلق ثم یعیده﴾ ئەو خوایەش لەسەرەتاوە گشت ئەوخەڵکە بەدیدێنێ، لەپاشان دوای مردن و تیاچوون وەك خۆی لێدەکاتەوەو زیندووی دەکاتەوە ﴿و هو أهون علیه﴾ وە ئەوەش بۆ ئەو ئاسانتریشە لەجاری یەکەم، چونکە جاری دووەم لەسەر بنەڕەت و بناغەیەك دروستی ئەکاتەوە، دیارە ئەم ئاسانیی و نائاسانیە بەپێی توانا و ژیریی مرۆڤە، ئەگەرنا هەمووشتێك بۆخوا وەك یەکە بۆیە ئەفەرموێ: ﴿و له المثل الأعلی فی السموات والارض﴾ مەسەل و وەصفی هەرە بەرز لەئاسمانەکان و زەوییدا هەرشایانی ئەوە ﴿وهو العزیز الحکیم﴾ ئەویشە دەسەڵاتداری کارجوان.

سُورَةُ الرُّومِ — الجزء الحادي والعشرون

وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَن تَقُومَ ٱلسَّمَآءُ وَٱلْأَرْضُ بِأَمْرِهِۦۚ ثُمَّ إِذَا دَعَاكُمْ دَعْوَةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ إِذَآ أَنتُمْ تَخْرُجُونَ ﴿٢٥﴾ وَلَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِۖ كُلٌّ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ ﴿٢٦﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِۚ وَلَهُ ٱلْمَثَلُ ٱلْأَعْلَىٰ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢٧﴾ ضَرَبَ لَكُم مَّثَلًا مِّنْ أَنفُسِكُمْۖ هَل لَّكُم مِّن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُم مِّن شُرَكَآءَ فِى مَا رَزَقْنَٰكُمْ فَأَنتُمْ فِيهِ سَوَآءٌ تَخَافُونَهُمْ كَخِيفَتِكُمْ أَنفُسَكُمْۚ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٢٨﴾ بَلِ ٱتَّبَعَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ أَهْوَآءَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍۖ فَمَن يَهْدِى مَنْ أَضَلَّ ٱللَّهُۖ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٢٩﴾ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًاۚ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَاۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ ۞ مُنِيبِينَ إِلَيْهِ وَٱتَّقُوهُ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَلَا تَكُونُوا۟ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٣١﴾ مِنَ ٱلَّذِينَ فَرَّقُوا۟ دِينَهُمْ وَكَانُوا۟ شِيَعًاۖ كُلُّ حِزْبٍۭ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ ﴿٣٢﴾

الحزب ٤١

٤٠٧

**ئەم مەسەلەش وەرگرە بۆتاك و تەنیایی خوا:**

﴿٢٨ ضرب لکم مثلا من انفسکم﴾ خوا هەرلەخۆتان مەسەل ونمونەیەکی بۆهێنانەوە، بۆگونجاویی و نەگونجاویی شەریك بڕیاردران وە بۆئەوەی چاك بزانن کەئێوە چەندە هەڵەن بڕیاری هاوەڵ دەدەن بۆ خوا! وەك خۆی ئەفەرمووێ: ﴿هل لکم مما ملکت ایمانکم من شرکاء فیما رزقناکم فأنتم فیه سواء تخافونهم کخفیتکم انفسکم﴾ ئایا لەوماڵ وسامانەدا بەئێوەمان داوە ڕازیی‌دەبن بەندەکانتان بکەنە هاوبەشی‌خۆتان ئەوسا هەردولا وەکویەك بن؟ هەروەکو ئێوەی ئازادلە ماڵێکی هاوبەشدا بێ یەکتر دەستی بۆنابەن ولەیەکتر دەترسن ئاواش ترستان لەمان هەبێ و نەتوانن بێ ئەوان تەنها شتێکی لێ خەرج بکەن، جائەگەر ئەوە بۆخۆتان ڕازی نەبن، ئەی چۆن هاو بەشانێك بۆ خوا دادەنێن؟! ﴿کذلك نفصل الآیات لقوم یعقلون﴾ ئا بەوجۆرە بەڵگەو نیشانەکانی خۆمان ڕوون دەکەینەوە بۆ

ئەوکەسانە ژێری دەخەنە کارو تێدەگەن ﴿ [٢٩] بل إتبع الذين ظلموا أهواء هم بغير علم﴾ ئەو هاوەڵەی ئەوان بڕیاری ئەدەن بۆخوا، وەنەبێ بەڵگەو نیشانەیەکیان بەدەستەوە بێ، نەخێر بەڵکو ستەمکارانی موشریك هەر بێزانست و زانیاریی و هەربەکوێرانە لەهەواو ئارەزووی خۆیان پەیڕەوی ئەکەن ﴿فمن يهدی من اضل الله﴾ هەر کەسێکیش گومڕای بکا ئیتر چ کەسێك ئەتوانێ ڕێنمایی بکات؟! ﴿و مالهم من ناصرين﴾ هیچ یارو یاوێدەدەرێکیان بەهانا نایە یاریدەیان بدا لەسزای خوا ڕزگاریان بکات.

**هەر روو لەدینی ئیسلام بکە:**

﴿ [٣٠] فأقم وجهك للدين حنيفا﴾ جاکەواتە (ئەی ئینسان) زۆر بەپاکیی ودروستیی ڕوو هەرلەم ئایینە پاك و بێگەردەی ئیسلامە بکە ﴿فطرة الله التی فطر الناس عليها﴾ لەسەر ئەو خیلقەتە بن خوا خەڵکانی لەسەر دروستکردووە، واتە: پەیڕەوی ئاینی یەك خواپەرستی بکەن ﴿لاتبديل لخلق الله﴾ نابێ هیچ جۆرە گۆڕانکارییەك لە دروستکراوی خوادا بکرێ کە خەڵکی لەسەر دروستکردووە ﴿ذلك الدين القيم﴾ هەر ئەوەیشە دینی ڕێك و ڕاست ﴿ولكن اكثر الناس لايعلمون﴾ بەڵام زۆربەی ئاپۆرەی مەردوم نازانن هەقیقەتی ئەوە ﴿ [٣١] منيبين إليه واتقوه و اقيموا الصلاة﴾ خەڵکینە! تۆبەکارانە بگەڕێنەوە لای خواو پەشیمان ببنەوە وهەرلەویش بترسن و، نوێژەکانیشتان بەڕێك وپێك ئەنجام بدەن ﴿ولا تكونوا من المشركين﴾ ولە موشریکانیش مەبن ﴿ [٣٢] من الذين فرقوا دينهم وكانوا شيعا﴾ لەوانەی کەئایینی خۆیان پچڕپچڕ کردو بوونە چەندین گروپ ودەستەوبەستە، هەر یەکە بەلای خۆیا ئەیتاشیی وخۆی بەهەق ئەزانی ﴿كل حزب بما لديهم فرحون﴾ هەر پارت وگروپێك بەبەرنامەو بیروباوەڕی خۆیان دڵخۆشن.

الجزء الحادي والعشرون — سورة الروم

وإذا مس الناس ضر دعوا ربهم منيبين إليه ثم إذا أذاقهم
منه رحمة إذا فريق منهم بربهم يشركون (٣٣) ليكفروا بما
ءاتينهم فتمتعوا فسوف تعلمون (٣٤) أم أنزلنا عليهم
سلطنا فهو يتكلم بما كانوا به يشركون (٣٥) وإذا أذقنا
الناس رحمة فرحوا بها وإن تصبهم سيئة بما قدمت أيديهم
إذا هم يقنطون (٣٦) أولم يروا أن الله يبسط الرزق لمن يشاء
ويقدر إن في ذلك لأيت لقوم يؤمنون (٣٧) فات ذا القربى
حقه والمسكين وابن السبيل ذلك خير للذين يريدون
وجه الله وأولئك هم المفلحون (٣٨) وما ءاتيتم من ربا
ليربوا في أموال الناس فلا يربوا عند الله وما ءاتيتم من زكوة
تريدون وجه الله فأولئك هم المضعفون (٣٩) الله الذي
خلقكم ثم رزقكم ثم يميتكم ثم يحييكم هل من
شركائكم من يفعل من ذلكم من شيء سبحنه وتعلى
عما يشركون (٤٠) ظهر الفساد في البر والبحر بما كسبت
أيدي الناس ليذيقهم بعض الذي عملوا لعلهم يرجعون (٤١)

قل سيروا ٤٠٨

**مرۆڤ لەسەر بارێك نۆقرە ناگرێ!:**

﴿ [٣٣] وإذا مس الناس ضر دعوا ربهم﴾ کاتێ خەڵکی بەڵاو زیانێکیان بەسەردێ هاناو هاوار بۆ پەروەردگاری خۆیان ئەبەن بۆئەوەی ڕزگاریان بکات ﴿منيبين إليه﴾ واز لەهەمووشتێك دێنن وبەرەو ئەودەگەڕێنەوە ﴿ثم إذا اذاقهم منه رحمة﴾ لەپاشا ئەگەر خوا دەرووی خێری لێکردنەوەو ڕەحمەتی خۆی بەوان دا ﴿إذا فريق منهم بربهم يشركون﴾ لەناکاو دەستەیەکیان شەریك وهاوبەش بۆپەروەردگاریان دائەنێن وپەیمانەکەیان لەبیر ئەچێتەوەو، دەچنەوە سەرباری لارەکەی خۆیان!! ﴿ [٣٤] ليكفروا بما آتيناهم﴾ بۆئەوەی سەرەنجام کافرو بێ باوەڕ بن بەو نیعمەتانەی پێمان داون ﴿فتمتعوا فسون تعلمون﴾ دەسا ڕابوێرن بەئارەزووی خۆیان ولەزەت ببەن، ئەوسا لە ڕۆژی خۆیدا چاك ئەزانن چییان پێئەکەین ﴿ [٣٥] ام انزلنا عليهم سلطانا﴾ یا خۆ مەگەر بەڵگەیەکمان بۆ ناردون نیشانەی دروستیی پەرستنی بتەکان بێ؟ ﴿فهويتكلم بماكانوا به يشركون﴾ کەئەوبەڵگەیە دەربارەی هاوبەش وشەریك بۆمن

قسەو پشتگیری بکا؟ ﴿٣٦ وإذ أذقنا الناس رحمة فرحوابها﴾ هەرکات ئێمە بەو خەڵکە نیعمەتێکمان چەشت، خێرا پێی خۆشحاڵ ئەبن و پێی فریو ئەخۆن ﴿وإن تصبهم سيئة بما قدمت أيديهم﴾ خۆئەگەر بەهۆی کاروکرداری خراپی خۆیانەوە بەڵاو ئازارێکیان تووش بوو ﴿إذا هم يقنطون﴾ خێرا بێهیواو بێ ئومێد ئەبن ودنیایان لێدیتە یەك! وەك باوونەریتی هەموو مرۆڤێکی موشریك و کافر ﴿٣٧ أولم يروا أن الله يبسط الرزق لمن يشاء ويقدر﴾ بۆچی سروشتیان ئاوایە؟ ئەی مەگەر نازانن کە: گشت ڕزق وڕۆزیی وسامان بەدەست خوایە، بۆکەسێ خۆی بیەوێ، زۆر دەبەخشێت، بۆکەسێکیش کەم، ئیتر بۆئەوەندە دانەمەزراون؟ ﴿إن في ذلك لآيات لقوم يؤمنون﴾ بەڕاستی لەوەدا چەندین بەڵگە هەیە بۆ ئەوکەسانەی ئامادەییان تێدایەو دەیانەوێ باوەڕبێنن.

**فەرماندان بە پارازتنی مافی خزمایەتیی و ، نەهیی کردن لەسوود خۆری:**

﴿٣٨ فآت ذا القربى حقه والمسكين وابن السبيل﴾ کەواتە ئەی ئەوکەسە! خوامالّ وسامانی پێداویت، مافی خزمان وهەژاران و ڕێبواران (لەرێ جیماوان) بدە،واتە: لەوداراییە هەتە ، هەمیشە چاوت لییانەوەبێت ﴿ذلك خير للذين يريدون وجه الله﴾ ئەومافپێدانە چاکترو باشترە بۆئەوانەی ڕەزامەندی خوایان ئەوێ ﴿وأولئك هم المفلحون﴾ بێگومان ئائەوکەسانە -ئەوئاکارەچاکانە ئەکەن - ڕزگارو سەرفرازن ﴿٣٩ وما آتيتم من ربا ليربو في أموال الناس﴾ ئەی دەوڵەمەندەکان! ئەوەی بەناوی سوو (ریباوە) داوتانە, هەتا لەناو سامان ودارایی خەڵکدا زیادببێ ﴿فلا يربو عند الله﴾ لای خوا هیچ زیاد ناکاوبەرەکەتی تێ ناکەوێ، کەواتە هەردەم ماڵ بەقەرز-بەبێ سوو- بدەن باشترە ﴿وما آتيتم من زكاة تريدون وجه الله﴾ ئەومالەی بەناوی زەکاتەوە، یان بەناوی خێروخێراتەوە دەیبەخشن و ڕەزامەندی خواتان دەوێت نەك لەبەرئەوە لەدنیادا سوودێکتان دەست بکەوێ ﴿فأولئك هم المضعفون﴾ ئا ئەوانە کەدارایی ومالی خۆیان بۆخوا دەبەخشن، پاداشی چەندبەرامبەریان پێدەگات ﴿٤٠ الله الذي خلقكم ثم رزقكم﴾ ئەوخوایە دروستیکردوون، پاشانیش ڕسق وڕۆزی پێبەخشیین ﴿ثم يميتكم ثم يحييكم﴾ ئینجا ئەتانمرێنێ، دیسان دەتانژێنێتەوە بۆوەرگرتنەوەی پاداش و تۆڵە ﴿هل من شركائكم من يفعل من ذلكم من شئ﴾ دەئایا هیچ یەك لەوهاوبەشانە ئێوە بۆخواتان داناوە, توانای شتێکی وایان هەیە بیکەن؟ وەك بەدیهینان، مراندن، زیندووکردنەوە، ڕۆزیدان ﴿سبحانه وتعالى عما يشركون﴾ پاکیی وبڵندیی هەربۆئەو زاتەیە، کەوەی کە دەیکەنە هاوبەشیی،لەبت وخواناهەقەکانیان.

**گەندەکاری لە پەژوو دەریا سەری هەڵدا:**

﴿٤١ ظهر الفساد في البر والبحر بما كسبت أيدي الناس﴾ پشێوی, واتە:برسیەتیی وقات وقریی و گرانیی, نائەمنی و خنکان و نەخۆشی و بوومەلەرزەلەبەژودەریادا بەدیارکەوت, بەهۆی تاوان وگوناهی خەڵکەوە ﴿ليذيقهم بعض الذي عملوا﴾ دەبا هەندێ تالاوی کردەوەکانیان پێ بچێژێ ﴿لعلهم يرجعون﴾ بەڵکو هۆشی بکەنەوە وپەشیمان ببنەوەو بگەڕێنەوە لایخوا ﴿٤٢ قل سيروا في الأرض فانظروا كيف كان عاقبة الذين من قبل﴾ پێیان بڵێ: بەرووی زەوییدا بگەڕێن وگەشت بکەن، ببینن بگەڕێن ووبنواڕن وبزانن ئەوانەی لەبەرابوون پاشەڕۆژیان چۆن بوو کاتێ سەرپیچییان کردو، لەفەرمانی خوا دەرچوون ﴿كان أكثرهم مشركين﴾ زۆربەیان موشریك بوون و، سەرەنجامیش تیاچوون.

**بەرلەرۆژی قیامەت،باش روو لەم دینە بکە:**

﴿[٤٣] فأقم وجهك للدين القيم من قبل أن يأتي يوم لا مرد له من الله﴾ کەواتە رووکە لەوئایینە ڕاست و
وتێروتەواوە، پێش ئەوەی ڕۆژێك بێ گەڕانەوەی نیە لەخواوە ﴿يومئذ يصدعون﴾ لەورۆژەدا هەموو پەراگەندە
وپرش وبلاوئەبن، دەبنە دوودەستە: دەستەیەك بۆدۆزەخ، دەستەیەکیش بۆبەهشت ﴿[٤٤] من كفر فعليه كفره﴾
هەرکەسێك کافرو بێباوەڕ بێ،ئۆباڵی‌کفرو بێباوەڕیەکەی، لەسەر خۆیەتی ﴿ومن عمل صالحا فلأنفسهم يمهدون﴾
کێیش کاروکردەوەی چاکی ئەنجام داوە، لەپاشەڕۆژدا بۆ خۆیان، جێگە خۆش وئامادە دەکەن ﴿[٤٥] ليجزي الذين
آمنوا وعملوا الصالحات من فضله﴾ هەتا لەچاکەی خۆی پاداشتی ئەوانە بداتەوە بڕوایان هێناوە وکارەچاکەکانیان

سُورَةُ الرُّومِ — الجزء الحادي والعشرون

قُلْ سِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلُ
كَانَ أَكْثَرُهُم مُّشْرِكِينَ ﴿٤٢﴾ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ ٱلْقَيِّمِ مِن
قَبْلِ أَن يَأْتِىَ يَوْمٌ لَّا مَرَدَّ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ يَوْمَئِذٍ يَصَّدَّعُونَ ﴿٤٣﴾ مَن
كَفَرَ فَعَلَيْهِ كُفْرُهُۥ وَمَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِأَنفُسِهِمْ يَمْهَدُونَ ﴿٤٤﴾
لِيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِن فَضْلِهِۦٓ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ
ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٤٥﴾ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَن يُرْسِلَ ٱلرِّيَاحَ مُبَشِّرَٰتٍ وَلِيُذِيقَكُم
مِّن رَّحْمَتِهِۦ وَلِتَجْرِىَ ٱلْفُلْكُ بِأَمْرِهِۦ وَلِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ
تَشْكُرُونَ ﴿٤٦﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ رُسُلًا إِلَىٰ قَوْمِهِمْ فَجَآءُوهُم
بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَٱنتَقَمْنَا مِنَ ٱلَّذِينَ أَجْرَمُوا۟ وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نَصْرُ
ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٧﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِى يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَيَبْسُطُهُۥ
فِى ٱلسَّمَآءِ كَيْفَ يَشَآءُ وَيَجْعَلُهُۥ كِسَفًا فَتَرَى ٱلْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ
خِلَٰلِهِۦ فَإِذَآ أَصَابَ بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦٓ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ
﴿٤٨﴾ وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبْلِ أَن يُنَزَّلَ عَلَيْهِم مِّن قَبْلِهِۦ لَمُبْلِسِينَ
﴿٤٩﴾ فَٱنظُرْ إِلَىٰٓ ءَاثَٰرِ رَحْمَتِ ٱللَّهِ كَيْفَ يُحْىِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ
مَوْتِهَآ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٥٠﴾

٤٠٩

کردووە ﴿إنه لايحب الكافرين﴾ بەڕاستیی خوا بێ‌بڕوایان
وناشوکرانی خۆشناوێ، کەچی هێشتا هەر ستەمیشیان
لێناکا.

**(با )کان لە نیشانەکانی توانایی و مەزنیی خوان:**

﴿[٤٦] و من آياته أن يرسل الرياح مبشرات﴾ یەکێ
لەبەڵگەو نیشانەکانی گەورەیی خوا ئەوەیە کە بایانی
موژدەدەر دەنێرێ بۆهەرشوێن وجێگایەك خۆی
ویستی‌لەسەر بێت ﴿وليذيقكم من رحمته﴾ بۆئەوەی لە
رەحمەت ومیهرەبانی خۆیتان پێ‌بچێژێ، واتە: بەبەزەیی
خۆی بارانتان بۆ ببارێنێ، ئەوجا خۆتان و ماڵاتتان پێی
بژین ﴿ولتجري الفلك بأمره﴾ وە کەشتییەکانیش بەفەرمانی
ئەو بەدەریاکاندابێن وبچن ﴿ولتبتغوا من فضله﴾ و لەفەزڵ
و دەهەندیی ولوتفی ئەو بەهرە وەرگرن وڕۆزی پەیدابکەن
بەهۆی بازرگانیی وشتی واوە ﴿ولعلكم تشكرون﴾ بەشکو
سوپاسگوزاربن ﴿[٤٧] ولقد أرسلنا من قبلك رسلا إلى قومهم﴾
بەڕاستیی پێش لەتۆیش ئەی پێغەمبەر ﷺ پەیامبەرانی
زۆرمان ڕەوانەکردن بۆلای هۆزو گەلیان ﴿فجاؤهم بالبينات﴾
ئەوجا هەموویان بە بەڵگەو نیشانەیەکی زۆری ئاشکراوە هاتنە لایان، بەڵام ئەوان هەرباوەڕیان نەهێنا ﴿فانتقمنا من
الذين أجرموا﴾ جا ئێمەش تۆڵەمان سەند لەوانەی تاوانیان کردو کافر بوون ﴿وكان حقا علينا نصر المؤمنين﴾
خۆسەرخستن ویارمەتیدانی بڕوادارانیش مافێکە لەسەر خۆمان واجبمان کردووە بۆیان. دیسانەوە باسی
چەسپاندنی یەك خوا پەرستیی دەکات (الله الذی یرسل الریاح) ئەو خوا دەسەڵاتدارەیە ئەو بایانە ئەنێرێ ﴿فتثير
سحابا﴾ ئەوانیش هەورەکە دەبزوێنن ﴿فيبسطه في السماء كيف يشاء﴾ ئینجا هەر جۆرێکی بیەوێ ئەوهەورە
لەئاسمانا پرژو بلاو دەکاتەوە ﴿ويجعله كسفا﴾ بەش بەش و پارچە پارچەشی دەکا، ئینجا کەڵەکەی دەکا ﴿فترى
الودق يخرج من خلاله﴾ ئینجا دەبینی لەناو ئەو هەورەوە نم نم باران دێتە خوارێ ﴿فإذا أصاب به من يشاء من
عباده﴾ بۆ هەرکەسێك لەبەندەکانی خۆی مەیلی بوو بینێرێ ﴿إذا هم يستبشرون﴾ لەناکاو هەموو خۆشحاڵ و

کەیف خۆش ئەبن ﴿٤٩ وإن کانوا من قبل أن ینزل علیهم من قبله لمبلسین﴾ بێگومان پێش ئەوە بارانیان بۆ ببارێنرێت بێ هیواو بێ ئومێد بوو بوون، پێیان وابوو هەرگیز دڵۆپێ نابارێ ﴿٥٠ فانظر إلی آثار رحمت الله کیف یحی الأرض بعد موتها﴾ دەسائەی مرۆڤی ژیروهۆشیار! تەماشای ئاسەواری بەزەیی خوا (باران) بکە، پاش مردنی زەویی و نەمانی هێزی رواندن و سەوزکردنی چۆنی زیندوودەکاتەوە ﴿إن ذلك لمحی الموتی﴾ بەراستی ئەوەی ئەوە دەکات مردووانیش زیندوو دەکاتەوە ﴿و هو علی کل شئ قدیر﴾ وە ئەویشە بەسەر هەمووشتێکد بەتواناو دەسەڵاتدارە ﴿٥١ ولئن أرسلنا ریحا فرأوه مصفرا﴾ خۆئەگەر بایەکی بە زیان و وشك بنێرینە سەر کشتوکاڵ و مەزرایان، ئینجا ببینن بە زەرد هەڵگەڕاوی ﴿لظلموا من بعده یکفرون﴾ بەدوایدا دەست دەکەنە ناشوکریی و ناسوپاسیی، واتە: خێرا دەگەڕێنەوە سەر بەدکاری خۆیان، چونکە زۆر لاسارو بێ بارن، لەکاتی خۆشیدا خۆشحاڵ ئەبن، لەکاتی بەڵاشدا زوو تێکدەچن و لاڕێ دەبن، وەك ئەفەرمووێ: (افرایتم ما تحرثون... بل نحن محرومون) ٥٦/٦٣-٦٧.

**مرۆڤی کافر: مردوو و کەڕو کوێرە:**

خوای گەورە دڵی پەیامبەر ﷺ ئەداتەوە و ئەفەرمووێ: ﴿٥٢ فإنك لا تسمع الموتی ولا تسمع الصم الدعاء﴾ ئینجا بێگومان تۆ ئەی موحەممەد ﷺ ناتوانی بەمردووان و کەڕان دەنگ و بانگ کردن ببیسێنی، واتە: بێ بڕواکان وەك مردوو کەڕ وانە، هیچ شتێك نابیسن وهیچ شتێك وەرناگرن ﴿إذا ولوا مدبرین﴾ هەرکات رووت لێ وەرسوڕێن و پشتت لێ هەڵکەن ﴿٥٣ وما أنت بهادی العمی عن ضلالتهم﴾ وە تۆ ناتوانی رێنمایی نابینایان بکەیت و، لەگومڕایی ڕزگاریان بکەیت و بیانهێنیتەوە سەر ڕێگەی ڕاست ﴿إن تسمع إلا من یؤمن بآیاتنا﴾ بەڵکو دەتوانیت هەرتەنها بەوانە باوەڕ دەکەن، قسەی خۆت ببیسێنی و گوێ بدەنە ئایەتەکانی ئێمە ﴿فهم مسلمون﴾ جا ئەوانە چییان پێ بڵێیت گوێ ڕایەڵ وملکەچ دەبن.

سُورَةُ الرُّومِ — الجزء الحادي والعشرون

وَلَئِنْ أَرْسَلْنَا رِيحًا فَرَأَوْهُ مُصْفَرًّا لَّظَلُّوا مِنۢ بَعْدِهِۦ يَكْفُرُونَ
﴿٥١﴾ فَإِنَّكَ لَا تُسْمِعُ الْمَوْتَىٰ وَلَا تُسْمِعُ الصُّمَّ الدُّعَآءَ إِذَا وَلَّوْا
مُدْبِرِينَ ﴿٥٢﴾ وَمَآ أَنتَ بِهَٰدِ الْعُمْىِ عَن ضَلَٰلَتِهِمْ إِن تُسْمِعُ إِلَّا
الحزب ٤١ مَن يُؤْمِنُ بِـَٔايَٰتِنَا فَهُم مُّسْلِمُونَ ﴿٥٣﴾ ۞ اللَّهُ الَّذِى خَلَقَكُم
مِّن ضَعْفٍ ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعْدِ ضَعْفٍ قُوَّةً ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعْدِ
قُوَّةٍ ضَعْفًا وَشَيْبَةً يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ وَهُوَ الْعَلِيمُ الْقَدِيرُ ﴿٥٤﴾
وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ يُقْسِمُ الْمُجْرِمُونَ مَا لَبِثُوا غَيْرَ سَاعَةٍ
كَذَٰلِكَ كَانُوا يُؤْفَكُونَ ﴿٥٥﴾ وَقَالَ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ وَالْإِيمَٰنَ
لَقَدْ لَبِثْتُمْ فِى كِتَٰبِ اللَّهِ إِلَىٰ يَوْمِ الْبَعْثِ فَهَٰذَا يَوْمُ الْبَعْثِ
وَلَٰكِنَّكُمْ كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٥٦﴾ فَيَوْمَئِذٍ لَّا يَنفَعُ الَّذِينَ
ظَلَمُوا مَعْذِرَتُهُمْ وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ ﴿٥٧﴾ وَلَقَدْ ضَرَبْنَا
لِلنَّاسِ فِى هَٰذَا الْقُرْءَانِ مِن كُلِّ مَثَلٍ وَلَئِن جِئْتَهُم بِـَٔايَةٍ
لَّيَقُولَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا إِنْ أَنتُمْ إِلَّا مُبْطِلُونَ ﴿٥٨﴾ كَذَٰلِكَ
يَطْبَعُ اللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٩﴾ فَاصْبِرْ إِنَّ
وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ وَلَا يَسْتَخِفَّنَّكَ الَّذِينَ لَا يُوقِنُونَ ﴿٦٠﴾

٤١٠ — سُورَةُ لُقْمَانَ

**قۆناغەکانی دروستکردنی مرۆڤ:**

﴿٥٤ الله الذی خلقکم من ضعف﴾ خوا هەرئەودەسەڵاتدارەیە کەئێوەی لەبنەمایەکی لاوازو بێ هێز بەدیهینا، لەو ئاوو (نطفە)یە ﴿ثم جعل من بعد ضعف قوة﴾ لەپاشا دوای بێ هێزیی و لاوازیی، هێزێکی پێدان، واتە: دوای بڕینی قۆناغی منداڵی گوڕی پێدان و کردنیە لاو ﴿ثم جعل من بعد قوة ضعفا وشیبة﴾ ئەوسا دوای هێزو لاویەتی، گوڕی لێسەندن و پیری کردن ﴿یخلق ما یشاء﴾ بەمەیلی خۆی بەدی دێنێ هەرچی بیەوێ ﴿وهو العلیم القدیر﴾ ئەویشە زانای بەتوانا، واتە: زانایە بە هەموو شتێك، وە بەتوانایە لەسەر هەمووشتێك.

**كه قیامەت هات تاوانباران دەڵێن: هەر ساتێ ژیاوین:**

﴿٥٥ ویوم تقوم الساعة یقسم المجرمون﴾ ڕۆژێ کەقیامەت بەرپا دەبێت تاوانباران (کافران) سوێند ئەخۆن ﴿مالبثوا غیر ساعة﴾ بەدەرلەساتێك نەماونەتەوە لە دنیادا ﴿كذلك كانوا یؤفكون﴾ هەرئاواش بوو لەدنیادا لا دەدران لە هەق، بۆ ناهەق و باتڵ ﴿٥٦ وقال الذین أوتوا العلم والإیمان﴾ ئەوکەسانەش زانست وئیمانیان پێدرابوو، واتە: زانا و ئیماندارەکان پێیان ئەڵێن: ﴿لقد لبثتم فی كتاب الله إلی یوم البعث﴾ بەڕاستی ئێوە لە نووسین و عیلمی خوادا ماونەتەوە تاڕۆژی زیندووبوونەوە ﴿فهذا یوم البعث﴾ خۆئەمەش ڕۆژی زیندوو بونەوەیە، کە ئێوە لە دنیادا ئینکاریتان لێدەکرد ﴿و لكنكم كنتم لا تعلمون﴾ بەلام ئێوە لەدنیادا نەتاندەزانی ئەمە هەق و ڕاستە ﴿٥٧ فیومئذ لاینفع الذین ظلموا معذرتهم﴾ ئیتر لەو ڕۆژەدا ستەمکاران بیانوو هێنانەوەیان سوودیان پێنابەخشێ ﴿ولاهم یستعتبون﴾ وە داواشیان لێناکرێ پۆزش بهێننەوە لەبەر سووکییان لەلای خوا.

**نموونە گەلێك دێنینەوەو خەڵكان قازا نجی لێ نابینن!:**

﴿٥٨ و لقد ضربنا للناس فی هذا القرآن من كل مثل﴾ بێگومان ئێمە لەم قورئانەدا هەمووجۆرە مەسەلێکمان بۆهیدایەتی ئەو خەڵکە هێنایەوە ﴿ولئن جئتهم بآیة﴾ لەگەڵ ئەوەیشدا ئەگەر تۆهەر نیشانەیەکی دەمکوتکریان بۆ بێنی، لەوانەی خۆیان پیشنیازی ئەکەن ﴿لیقولن الذین كفروا﴾ لەباتی خۆبەدەستەوە دان بێگومان بێ بڕواکان ئەڵێن: ﴿إن أنتم إلا مبطلون﴾ ئێوە هەر پڕوپاڵانتە چین ﴿٥٩ كذلك یطبع الله علی قلوب الذین لا یعلمون﴾ ئا بەوتەرزەش خوا مۆر دەنێت بەسەردڵی ئەوانەدا کەنەزان و نەفامن و دوای ئارەزووی خۆیان ئەکەون لەباتی ئامۆژگارییەکانی تۆ ﴿٦٠ فاصبر إن وعدالله حق﴾ سا تۆ ئەی موحەممەد! ﷺ ئارامت هەبێت لەسەر ئازاریان، بەڕاستیی بەڵێنی خوا حەقە و دێتەدی، بەسەر خستنت بەسەر دوژمنەکانتدا و پایەداری ئایینەکەت ﴿ولا یستخفنك الذین لایوقنون﴾ ئەوانەی بڕواو یەقینیان بەڕۆژی قیامەت و زیندوو بوونەوە نییە قەڵس و قەلەقت نەکەن، لەڕاگەیاندنی ئایینەکەت و لەخشتەت بەرن و لەڕێ بتترازێنن. (ئیبن جەریر) دەڵێ: (عەلی کوڕی ئەبی تالیب) نوێژی بەیانی دەکرد، پیاوێکی (خەواریج) پێیگوت: (لئن أشركت لیحبطن عملك و لتكونن من الخاسرین) واتە: ئەگەر کەسێ تر لەباتی خوا بپەرستیی، بێگومان کارەکانت پووچەڵ دەبێ و دەچییە ریزی زیانباران (عەلی)یش هەر لەنوێژەکەدا وەڵامی دایەوەو گوتی: (فاصبر إن وعد الله حق ولا یستخفنك الذین لایوقنون).

کۆتایی سوورەتی (رووم) لەتەك سوپاسی بێ پایاندا بۆ خوای لەکارزان و دلۆڤان.

والحمد لله والمنة.

*** *** ***

### ٣١- سوورەتی ( لوقمان )ـە .

### مەککەییەو ( ٣٤ ) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئـەم سـوورەتەیش وەك سـوورەتە مەککەییـەکانی تـر چارەسـەری مەسـەلەی: یەکخواپەرستیی، پەیامبـەرێتیی، زینـدوو بوونـەوە.. ئـەکات. سـەرەتا بەباسێکی قورئـان دەستپێدەکات، ئینجا هەنـدێ بەڵگـە لـەئاسمان و زەوییـدا دێنیتەوە بۆیەکتاپەرستیی و، بۆ ترساندنی مەردومیش بەباسێکی قیامەت کۆتایی دێ. پێیشی دەڵێن سوورەتی (لوقمـان)چـونکە وەسـیەتنامە گرنگەکـەی لوقمـانی حـەکیمی تێدایـە بۆکوڕەکـەی، کـەپڕە لـە وتوووێـژو گفتوگـۆو ئامۆژگارییەکانی بۆ خواناسین و بیروباوەڕی دامەزراوو بتـەو بە پاداشت وتۆڵە لەگەڵ کوڕەکەیدا. ئابەم شێوەیەش دەست پـێ ئـەکات: ﴿بسـم الله الـرحمن الـرحیم* [١] الم﴾ دیـارە کـە قورئان پێکهاتووە لەم جۆرە پیتانە، دەسا فەرموون ئێوەش وێنەی بێنن ئەگەر ئەتوانن ﴿ [٢] تلك آيات الكتاب الحكيم﴾ ئەمانـە ئایـەتی قورئـانێکی تۆکمـە و، پـڕ لەحیکمـەت و وردەکاریی ویاسای قەشەنگە ﴿ [٣] هدى ورحمة للمحسنين﴾ ڕێنیشـاندەرو بەزەییشـە بـۆ چـاککاران ,چـونکە ئـەوانن ئامادەییان تێدایە بۆ سوود لێ وەرگرتنی ﴿ [٤] الذين يقيمون الصـلاة﴾ ئەوانـــەی کەنوێـــژەکانیان بـــەتێرو تەســـەلی ئەنجامدەدەن ﴿ويؤتون الزكاة﴾ ولەماڵ وسامانیش زەکات دەدەن ﴿وهم بالآخرة هم يوقنون﴾ بەڕۆژی سەڵاو دواییش خـاوەن یـەقین ودڵنیـان ﴿ [٥] اولئـك علـى هـدى مـن ربهـم﴾ ئائەوانن لەسەر ڕێنموونی و ڕێگەی ڕاستی پەروەردگار یانن ﴿واولئك هم المفلحون﴾ وهەر ئەمانەشن سەرکەوتوو ڕزگار و بەختیار.

الجزء الحادي والعشرون — سورة لقمان

سُورَةُ لُقۡمَانَ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓمٓ ﴿١﴾ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡحَكِيمِ ﴿٢﴾ هُدٗى وَرَحۡمَةٗ
لِّلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٣﴾ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم
بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ يُوقِنُونَ ﴿٤﴾ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدٗى مِّن رَّبِّهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ
هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴿٥﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشۡتَرِي لَهۡوَ ٱلۡحَدِيثِ
لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ بِغَيۡرِ عِلۡمٖ وَيَتَّخِذَهَا هُزُوًاۚ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ
عَذَابٞ مُّهِينٞ ﴿٦﴾ وَإِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِ ءَايَٰتُنَا وَلَّىٰ مُسۡتَكۡبِرٗا
كَأَن لَّمۡ يَسۡمَعۡهَا كَأَنَّ فِيٓ أُذُنَيۡهِ وَقۡرٗاۖ فَبَشِّرۡهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٧﴾
إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمۡ جَنَّٰتُ ٱلنَّعِيمِ ﴿٨﴾
خَٰلِدِينَ فِيهَاۖ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٗاۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٩﴾ خَلَقَ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيۡرِ عَمَدٖ تَرَوۡنَهَاۖ وَأَلۡقَىٰ فِي ٱلۡأَرۡضِ رَوَٰسِيَ أَن تَمِيدَ
بِكُمۡ وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٖۚ وَأَنزَلۡنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا
مِن كُلِّ زَوۡجٖ كَرِيمٍ ﴿١٠﴾ هَٰذَا خَلۡقُ ٱللَّهِ فَأَرُونِي مَاذَا
خَلَقَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦۚ بَلِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴿١١﴾

٤١١

### حاڵی هەندێ لە مرۆڤە گومڕا کەرەکان:

﴿ [٦] ومن الناس من يشترى لهو الحديث﴾ لە نێو خەڵکدا هەیە، وتـەی بێهودە: شانامەی عەجەم , یان هـەر فیکرەیـەکی رووخێنـەر,لـە تـۆی کتێبیکـدا, یـان لـەناو (سـیدی)یەکـدا دەکـرێ, یـان بـۆ خـۆی دەینووسـێ و, بۆچەواشەکردنی خەڵك بڵاوی دەکاتەوە.

(لهوالحدیث): مانایـەکی بـەربڵاوو فراوانـی هەیـە، چـونکە هـەموو جـۆرە وتـەیـەك ئادەمیی سـەرقاڵ بکـاو بـەرەو گومڕایی ڕایکێشێت، ئیتر گۆرانی و ئاوازی ئارەزوو بزوێن بێت، یا هەر وتەیەکی بێهوودە, ئەمانە هەموودەگرێتەوە. گوتراوە ئەم ئایەتەش سەبارەت بە (نەزری کوڕی حارس) دابەزی، چونکە دەچوو ئافرەتی گۆرانی بێژی دەهێناو، کاتێ بیستبای فلانێك دەیەوێت موسڵمان ببێت, خێرا دەچوو دەستی دەگرت و دەیبرد بۆلای ژنە گۆرانی بێژەکە وپێیدەگوت: دەسا هەرئێستا پێکێ شەرابی بۆ تێکەو بەئارەزووی خۆیشی گورانیی بۆبڵێ، پاشان پێیدەگوت: ئەمە

لەو نوێژو ڕۆژووەی مووحەممەد بۆئێوەی هێناوە باشترە!هەر ئەوبوو دەچوو شانامەو ئەوجۆرە کتێبانەی دەکڕی بەمەستی گومڕاکردنی خەڵکی و دەیوت: ئەگەر(موحوممەد) داستانی (عاد) و (سەموود)بۆ ئێوە باس دەکا, منیش داستانی (ڕۆستەم) و (ئەسفەندیار) و پاشاکانی ئێرانتان بۆ باس دەکەم. (مختصر تفسیر الطبری)، و (أسباب النزول للسیوطی). ﴿لیضل عن سبیل الله﴾ تاخەڵکی لەڕێگەی خوا چەواشە و گومڕا بکات، مەبەستی ئەوەیەکە مەردم سەرگەرم بکات بەگۆرانیی ڕابواردنەوە. بەڵێ.. هەر گۆرانییەك ئارەزوو بورووژێنێی وبەرەو فەسادو بێ ڕەوشتی مرۆڤ هەڵنێت، وەك گۆرانی بەبەژن و بالآی ئافرەتانداو جوان کردنی عارەق و.. هتد ئەوە یەك دەنگی زانایان هەیە لەسەر قەدەغەوحەرامێتی.. دەشڵێن مۆسیقایەکیش لە گەڵ ئەوانەدابێ حوکمی هەروایە. ﴿بغیر علم﴾ ئەوکارەش لەڕووی نەفامیی و، نەزانینەوە دەکا. واتە: بێ ئەوە گوێ بداو بزانێ بەمەترسی کارەکەی ﴿ویتخذها هزوا﴾ وە ئایەتەکانی قورئانیش دەکاتە گاڵتە جاڕی خۆی ﴿اولئك لهم عذاب مهین﴾ ئەوانە ئەوکارانە دەکەن سزایەکی ئابڕووبەریان بۆ هەیە پرسیار کرا لە (ئیبن مەسعوود) لەتەفسیری ئەم ئایەتە: (ومن الناس من یشتری لهو الحدیث) گوتی: (الغناء، والله الذی لا إله إلا هو (یرددها ثلاثا). (حسن البصری) گوتویەتی: (نزلت فی الغناء و المزامیر، قال الضحاك: (لهو الحدیث) یعنی: الشرك. وەزەیدی (ئیبن ئەسلم)یش وایگوتووە.وە (ئیبن جە ریر) گوتوویە: انه کل کلام یصد عن آیات الله واتباع سبیله. (ئیبن کەسیر)یش دەڵێ: (قوله: ((لیضل عن سبیل الله)) أي انما یصنع هذا للتخالف للإسلام وأهله. (موجاهد) گوتوویەتی: (قول الله ویتخذها هزوا) أي و یتخذ سبیل الله هزوا یستهزأ بها. وە(شێخ سەعدیی) لە تەفسیرەکەیدا دەڵێ: (دخل فی ((لهو الحدیث)) کل کلام محرم، وکل لغو، وباطل، وهذیان من الأقوال المرغبة فی الکفر والفسوق والعصیان، ومن أقوال الرادین علی الحق، المجادلین بالباطل لیدحضوا به الحق، ومن غیبة ونمیمة، وکذب، وشتم، وسب، ومن غناء ومزامیر شیطان..). (ئیمامی قورتوبی)یش دەڵێ:(لهو الحدیث): الغناء، فی قول ابن مسعود وإبن عباس وغیرهما، النحاس: وهو ممنوع بالکتاب والسنة)پاشان دەڵێ:(قلت:هذه إحدی الأیات الثلاث التی استدل بها العلماء علی کراهة الغناء والمنع منه. والآیة الثانیة قوله تعلی: (وانتم سامدون) ٦١/٥٣ قال ابن عباس: هوالغناء بالحمیریة. والآیة الثالثة: (واستفزز من استطعت منهم بصوتك)٦٤/١٧ قال مجاهد: الغناء والمزامیر. وروی الترمذي عن أبی أمامة عن رسول الله ﷺ قال: (لاتبیعوا القینات ولا تشتروهن ولاتعلموهن ولا خیر فی تجارة فیهن، وثمنهن حرام، فی مثل هذا انزلت هذه الآیة). لەپەروێزەکەیشیدا هاتووە:(إسناده واه) اخرجه الترمذی فی التفسیر (٣١٩٥)باب (٣٢)ومن سورة لقمان، وذکره الحافظ فی الفتح (٩١/١١) وضعفه. وحلف علی ذلك إبن مسعود بالله الذي لا إله إلا هو (ثلاث مرات) إنه الغناء. وعن إبن عمر إنه الغناء" وکذلك قال عکرمة ومیمون بن مهران ومکحول. ﴿[7] وإذا تتلی علیه آیاتنا﴾ هەر کاتێکیش ئایەتەکانی ئێمەی بەسەردا دەخوێنرێتەوە ﴿ولی مستکبرا کأن لم یسمعها﴾ بەفیزودەعیەوە ڕووی وەردەگێڕێ, هەروەك نەیبیستبێ ﴿کأن فی اذنیه وقرا﴾ دەڵێی هەردووگوێی قورس وگران بووبن ﴿فبشره بعذاب الیم﴾ سا تۆش مژدەی پێبدە بە سزایەکی بەئێش.

### ئاییندەی موسڵمانە چاکەکان:

﴿[8] إن الذین آمنوا وعملوا الصالحات﴾ بێگومان ئەوانەی باوەڕیان هێناو کاروکردەوە چاکەکانیان ئەنجام دا ﴿لهم جنات النعیم﴾ باخاتی پڕ نازونیعمەتی بەهەشتیی نەبڕاوەیان بۆهەیە ﴿[9] خالدین فیها﴾ بەهەتا هەتاییش تێیدا

ئەمێننەوەو هیچکات لێیناچنەدەرێ ﴿وعد الله حقا﴾ بەلینی خوایش ڕاست ودروستەو دێتەدی ﴿وهو العزيز الحكيم﴾ هەر ئەویشە بالادەستی، کارجوان و، ئەشزانێ کێ شایستەی چییە؟.

**بەڵگەی تاك و تەنیایی خوا:**

﴿[10] خلق السموات بغير عمد ترونها﴾ ئاسمانەکانی لەوبەرزەوە دروستکردووە بێئەوە هیچ ستوون وکۆڵەکەیەك ببینن ﴿والقى فى الأرض رواسى﴾ وچەند کێوێکیشی خستە زەمین ودایچەقاند وەك مێخ بۆ چادر ﴿ان تميد بكم﴾ نەوەك لەرزەو جم وجووڵ بەئێوە بکا ﴿وبث فيها من كل دابة﴾ وە هەموو جۆرە گیانلەبەرێکی تێدا بلاوکردەوە, کە مەگەر هەرخوا خۆی بەئەندازەو ژمارەیان بزانێ ﴿وانزلنا من السماء ماء﴾ لە ئاسمانیشەوە بارانێکمان بۆدابەزاندن, بۆ سوودی ئێوەو ئاژەڵەکانتان ﴿فأنبتنا فيها من كل زوج كريم﴾ ئینجا لەوێدا لە هەموجۆرە رووەك وگیایەکی هاولف وجووتی جوانی بەکەڵکمان ڕواند ﴿[11] هذا خلق الله﴾ ئەمە دروستکراوی خوایە "بەتەنها و بێ هاوەڵ و یارمەتیدەر وەدیهێناون ﴿فأرونى ماذا خلق الذين من دونه﴾ جا ئێوە ئەی خەڵکینە! نیشانم بدەن چیان دروستکردووە؟ئەوانەی جگەلە خوا ئێوە ئەیانپەرستن ﴿بل الظالمون فى ضلال مبين﴾ هیچیان دروست نەکردووە, بەڵکو موشریکەکان لەناوگومڕایەکی ئاشکرادان، کە بتان دەپەرستن ﴿[12] ولقد آتينا لقمان الحكمة﴾ بەڕاستیی حیکمەت و وردەکاریی وبیرتیژیی وڕای قبوولٌ وڕاستمان بەلوقمان دا. (سەعیدی کوڕی موسەیەب) دەڵێ: (لوقمان) قولە ڕەشەیەکی میصریی بوو، خوای گەورە ئەوگشت حیکمەت و ژیریی و وریاییەی پێ بەخشی، وەخاوەنی چەندان گوتارو وتەی هەرە بەرزە، وەپیاوێکی صالح وچاك بوو, بەلام پلەی پێغەمبەرێتی نەبووە. ﴿ان اشكرلله﴾ پێمان گوت: هەمیشە سوپاسی خوابکە لەسەر ئەوفەزڵ وبەهرەیە پێیدایت ﴿ومن يشكر فإنما يشكر لنفسه﴾ خۆ هەرکەسێك سوپاسی خوا بکات، بێگومان خێروبەرەکەتەکەی تەنها بۆخۆی ئەبێت ﴿ومن كفر فإن الله غنى حميد﴾ هەرکەسێکیش سپڵەوناسوپاس بێ، ئەوە ئارەزووی خۆیەتیی وخۆی زیانی کردووە، جابەڕاستیی خوا بێ‌نیازی هەمیشە سوپاسکراوە.

الجزء الحادي والعشرون　　سُورَةُ لُقۡمَانَ

وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا لُقۡمَٰنَ ٱلۡحِكۡمَةَ أَنِ ٱشۡكُرۡ لِلَّهِۚ وَمَن يَشۡكُرۡ فَإِنَّمَا
يَشۡكُرُ لِنَفۡسِهِۦۖ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ حَمِيدٞ ﴿١٢﴾ وَإِذۡ قَالَ
لُقۡمَٰنُ لِٱبۡنِهِۦ وَهُوَ يَعِظُهُۥ يَٰبُنَيَّ لَا تُشۡرِكۡ بِٱللَّهِۖ إِنَّ ٱلشِّرۡكَ
لَظُلۡمٌ عَظِيمٞ ﴿١٣﴾ وَوَصَّيۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيۡهِ حَمَلَتۡهُ أُمُّهُۥ
وَهۡنًا عَلَىٰ وَهۡنٖ وَفِصَٰلُهُۥ فِي عَامَيۡنِ أَنِ ٱشۡكُرۡ لِي وَلِوَٰلِدَيۡكَ
إِلَيَّ ٱلۡمَصِيرُ ﴿١٤﴾ وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشۡرِكَ بِي مَا لَيۡسَ
لَكَ بِهِۦ عِلۡمٞ فَلَا تُطِعۡهُمَاۖ وَصَاحِبۡهُمَا فِي ٱلدُّنۡيَا مَعۡرُوفٗاۖ
وَٱتَّبِعۡ سَبِيلَ مَنۡ أَنَابَ إِلَيَّۚ ثُمَّ إِلَيَّ مَرۡجِعُكُمۡ فَأُنَبِّئُكُم
بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿١٥﴾ يَٰبُنَيَّ إِنَّهَآ إِن تَكُ مِثۡقَالَ حَبَّةٖ مِّنۡ
خَرۡدَلٖ فَتَكُن فِي صَخۡرَةٍ أَوۡ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَوۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ يَأۡتِ
بِهَا ٱللَّهُۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٞ ﴿١٦﴾ يَٰبُنَيَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ وَأۡمُرۡ
بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَٱنۡهَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَۖ إِنَّ ذَٰلِكَ
مِنۡ عَزۡمِ ٱلۡأُمُورِ ﴿١٧﴾ وَلَا تُصَعِّرۡ خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلَا تَمۡشِ فِي ٱلۡأَرۡضِ
مَرَحًاۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخۡتَالٖ فَخُورٖ ﴿١٨﴾ وَٱقۡصِدۡ فِي مَشۡيِكَ
وَٱغۡضُضۡ مِن صَوۡتِكَۚ إِنَّ أَنكَرَ ٱلۡأَصۡوَٰتِ لَصَوۡتُ ٱلۡحَمِيرِ ﴿١٩﴾

٤١٢　　أَلَمۡ تَرَوۡاْ أَنَّ

**لوقمان ڕاسپاردەی کوڕەکەی دەکات:**

﴿[13] وإذ قال لقمان لابنه وهو يعظه﴾ بەیاد بکە کاتێ لوقمان بەکوڕەکەی خۆیگوت وئەوئامۆژگاری ئەکرد: ﴿يا بنى لاتشرك بالله﴾ کوڕەچکۆڵەکەم! هەر شتێك,یاکەسێك مەکە بە شەریك وهاوبەشی خوا ﴿إن الشرك لظلم عظيم﴾ بەڕاستیی شەریك وهاوبەشدانان بۆخوا , ستەمێکیگەورەیە لەهەموو تاوانێك گەورەترەو، هەرگیز بێتەوبە قابیلی عەفوو لێبوردن نیە. ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێت کە (شیرك) ستەمێکی ئێجگار مەزن وگەورەیە، هەروەکو

لەسوورەتی:١٠/١٠٦.(..فإنك إذا من الظالمين) وە لەسوورەتی (٢/٢٥٤)دا ولەفەرمودەیەکیشدا هاتووەکە: وشەی (ظلم)لەئایەتی (٦/٨٢)دا ,بە مانا(شرك)ـە. ﴿[١٤] ووصينا الإنسان بوالديه﴾ ئێمە دەربارەی باوك ودایك بەمرۆڤمان راگەیاند وئامۆژگاریمان کردکە: هەمیشە رەفتاری چاکەیان لەگەڵ بکەن ﴿حملته أمه وهنا على وهن﴾ بەتایبەتی لەگەڵ دایکییدا.. دایکی بەپێستی سك هەڵیگرتووە بەلاوازی لە سەر لاوازی,تالە داوێدیبەربوتەوە, هاتۆتە ئەم جیهانەوە﴿وفصاله في عامين﴾ شیر برینەوەشی دووساڵیخایاند، واتە: گەرمنداڵ پێویستیبە شیر هەبوو هەتا دوساڵ ئەیدرێتێو سوودی لێوەرئەگرێ ﴿أن اشكر لي ولوالديك﴾ کەوایە (ئەی مرۆڤ!) بەردەوام سوپاسی من بکە لەسەر نیعمەتەکانم و، سوپاسی باوك ودایکیشت بکە لەسەر ئەو هەموو ئەزیەت وئازارە لەپێناوی تۆدا چێشتوویانە ﴿إلى المصير﴾ گێرانەوەشتان هەر بۆلای منە ,دوای زیندوو بوونەوە ﴿[١٥] وإن جاهداك على أن تشرك بي ماليس لك به علم﴾ هەمیشە گویرایەڵیانبەو,لەسنووری رەزامەندیی خوادا، خۆئەگەر هەوڵیشیانداو پێیان داگرت لەسەرئەوە کە شتێك بکەی بەشەریك وهاوبەشم، کە هیچ بەڵگەو زانیارییەکت پێ نییە ﴿فلا تطعهما﴾ ئەوسا گوێرایەڵیان مەکە ﴿وصاحبهما في الدنيا معروفا﴾ وەلە لەدنیادا لەگەڵ هەردووکیاندا,بەشێوەیەکی چاك وپەسەند هاوەڵی بکە, هاورێ وهاوکارێکی چاك بە بۆیان بەجل وبەرگ وخۆراك وهەڵسوکەوتی چاك دڵخۆشیان بکە..هتد ﴿واتبع سبيل من أناب إلي﴾ وە بەردەوام هەرڕێگەی ئەوە بگرە کە بەرەو من رێگەی گرتۆتەبەرو گەڕاوەتەوە بۆلام ﴿ثم إلي مرجعكم فأنبئكم بما كنتم تعملون﴾ لەپاشا هەمووتان هەرلای من دەگەڕێنەوە، ئینجا لەوکاروکردەوەیەش لەدونیادا کردوتانە ئاگادارتان دەکەم ﴿[١٦] يا بني إنها إن تك مثقال حبة من خردل﴾ دووبارە ئەگەڕێتەوە سەر وەسیەتەکەی لوقمان: ئەی کورە چکۆڵەو شیرینەکەم! ئەگەر بەئەندازەی سەنگی دەنکە خەرتەلەیەك چاکە، یاخراپەت هەبێ ﴿فتكن في صخرة أو في السموات أو في الأرض﴾ لەناو دڵی بەردێکی کەڕدا، یان لە گۆشەیەك لە ئاسمانەکان، یان لە زەویدا بێت ﴿يأت بها الله﴾ لەرۆژی قیامەتدا خوا ئەیهێنێتەڕوو ﴿إن الله لطيف خبير﴾ بەڕاستیی خوا زۆر وردبینە,هیچ شتێکی وردی لێبزر نابێت, زۆریش بە ئاگایە, هەقیقەتی شتەکان هەموودەزانێ ﴿[١٧] يا بني أقم الصلاة﴾ ئەی کورە بچکۆلەو شیرینەکەم! هەمیشە نوێژەکانت بە تەواویو بەچاکی بەجێبهێنە ﴿وأمر بالمعروف﴾ فەرمان بەچاکە بدەو ﴿وانه عن المنكر﴾ ورێ لە گوناهو خراپەبگرە ﴿واصبر على ما أصابك﴾ لەسەر هەرئەو بەڵاونەهامەتییەی تووشت دەبێ خۆراگربە ﴿إن ذلك من عزم الأمور﴾ بێگومان ئەو کارانە – بۆم باسکردیت – لەوکارە پەسەندوگرنگانەیە خوا دەیەوێن ﴿[١٨] ولا تصعر خدك للناس﴾ کورم! بەفیزەوە ڕووت وەرمەگێڕە لەخەڵکیو رووتگرژ مەکە، بەڵکو هەردەم روخۆشبە، وەك ئەم فەرموودەیە گشت مرۆڤێ هەڵدەنێ بۆ روخۆشیی:((ولو أن تلقى أخاك ووجهك إليه منبسط)) ئەبوداود. ﴿ولا تمش في الأرض مرحا﴾ بەدەعیە وفیز مەڕۆ رێوە لەزەویدا, وەك ئەم ئایەتەش دەفەرمووێ: (ولا تمش في الأرض مرحا أنك لن تخرق الأرض ولن تبلغ الجبال طولا)(١٧/٣٨)، ﴿إن الله لا يحب كل مختال فخور﴾ بەڕاستیی خوا هیچ دەعیە بازو شانازیکەرێکی بەخۆ خۆشناوێت ﴿[١٩] واقصد في مشيك﴾ وە لە رۆیشتندا , نەشێنەیی و, نەتوند برۆ ,واتە:بارێکی مامناوەندیی پێش بگرە ﴿واغضض من صوتك﴾ وەلە دەنگیشت نزم بکەوە لەقسەوگفتوگۆدا ﴿إن أنكر الأصوات لصوت الحمير﴾ چونکە دەنگی هەرەناخۆش، ئەوەیە زیاد لەپێویست بەرز بکرێتەوە, زەڕەودەنگی کەرانە.

## یادخستنەوەی بەخششەکان:

﴿ [٢٠] الم تروا أن الله سخر لكم مافى السموات وما فى الأرض﴾ ئەی خەڵکینە! ئاخۆ نەتان دیوە کەخوا ئەوەی لەئاسمانەکان وزەویدایە, هەمووی بۆئێوە رامکردووە ﴿و أسبغ عليكم نعمه ظاهرة وباطنه﴾ وەنیعمەتەکانی بەئاشکراو بەنهێنی بۆ تەواو کردوون: چاو، تەندروستیی، دڵ، ژیریی..هتد. ﴿ومن الناس من يجادل فى الله بغير علم ولا هدى ولا كتاب منير﴾ کەچی لەگەڵ ئەوهەموو بەڵگانەشدا بۆ بوونی خوا.. هەندێ کەس هەن – بێ هیچ زانیاریی وبەڵگەو نامەیەك بۆیان روون بکاتەوە, لەبابەت خواوە –کێشەو هەرا ئەکەن! لەسوورەتی حەجدا: لەتەفسیری (ومن الناس) ئەمە زیاتر روون کراوەتەوە.
﴿[٢١] وإذا قيل لهم اتبعوا ما انزل الله﴾ خۆکاتێ بەوانە بگوترێ: ئێوە پەیڕەوی ئەوە بکەن خوا ناردوویەتی لەقورئاندا ﴿قالوا بل نتبع ماوجدنا عليه آباءنا﴾ لەوەڵاما دەڵێن: نا، بەڵکو ئێمە هەرپەیڕەوی لەوە ئەکەین کە باووباپیرانمانی لەسەر بوون، لە بتپەرستی و ئاییینی شیرك ﴿أو لوكان الشيطان يدعوهم إلى عذاب السعير﴾ باشەیتانیش بانگیان بکات بۆسزای دۆزەخ، ئەوان هەر سوور ئەبن لەسەرپەیڕەوی ئاییینی شیرك و باپیرانیان؟!!
﴿[٢٢] ومن يسلم وجهه إلى الله﴾ هەرکەسێك کە بەتەواوی وبەدڵێکیپاکەوە رووبکاتە خوا ﴿وهومحسن﴾ وچاکە کاریش بێت ﴿فقد استمسك بالعروة الوثقى﴾ بێگومان دەستی بە قوڵپی هەرەپتەوەوە گرتووە کەدەیگەیەنێ بەخوا، هەرچۆن کەسێك بەشاخێکدا سەرکەوێ، یان دابەزێ، دەست بە ئاڵقەیەکی زۆر قایمەوە دەگرێ، دیارە ئەمیش بەهێزترین رێگاو رێبازی بۆخۆی هەڵبژاردووە ﴿وإلى الله عاقبة الأمور﴾ وەئەنجامیهەمووکاریکیش هەربۆلای خوایە
﴿[٢٣] ومن كفر فلا يحزنك كفره﴾ وەئەوکەسەش کافروبێبڕوا دەبێ، باکوفرەکەیان تۆ دڵتەنگ نەکا وگوێی مەدەرێ ﴿إلينا مرجعهم فننبئهم بما عملوا﴾ چونکە گەڕانەوەی هەموویان هەربۆلای ئێمەیە، ئەوکاتە لە هەمووکاروکردەوەکانیان ئاگاداریان ئەکەین وبەپێی ئەوەیش "پاداش وتۆڵەیان ئەدەین ﴿إن الله عليم بذات الصدور﴾ چونکە بەڕاستیی خوا بە ڕازونیازی سینگەکان زاناو بەئاگایە
﴿[٢٤] نمتعهم قليلا﴾ کەمێك لەژیانی ئەم دونیا, ماوەیان دەدەین ڕابوێرن ﴿ثم نضطرهم إلى عذاب غليظ﴾ لەپاشان ناچاریان دەکەین بۆ ناو سزایەکی دژوار وسەخت.

الجزء الحادي والعشرون — سورة لقمان

أَلَمْ تَرَوْا أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَأَسْبَغَ
عَلَيْكُمْ نِعَمَهُ ظَٰهِرَةً وَبَاطِنَةً وَمِنَ النَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِي اللَّهِ
بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلَا هُدًى وَلَا كِتَٰبٍ مُّنِيرٍ ﴿٢٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّبِعُوا
مَا أَنزَلَ اللَّهُ قَالُوا بَلْ نَتَّبِعُ مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا أَوَلَوْ كَانَ
الشَّيْطَٰنُ يَدْعُوهُمْ إِلَىٰ عَذَابِ السَّعِيرِ ﴿٢١﴾ ۞ وَمَن يُسْلِمْ
الحزب ٤٢
وَجْهَهُ إِلَى اللَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ
وَإِلَى اللَّهِ عَٰقِبَةُ الْأُمُورِ ﴿٢٢﴾ وَمَن كَفَرَ فَلَا يَحْزُنكَ كُفْرُهُ
إِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ فَنُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ
﴿٢٣﴾ نُمَتِّعُهُمْ قَلِيلًا ثُمَّ نَضْطَرُّهُمْ إِلَىٰ عَذَابٍ غَلِيظٍ ﴿٢٤﴾
وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَٰوَٰتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ قُلِ
الْحَمْدُ لِلَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٥﴾ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَٰوَٰتِ
وَالْأَرْضِ إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ ﴿٢٦﴾ وَلَوْ أَنَّمَا فِي الْأَرْضِ
مِن شَجَرَةٍ أَقْلَٰمٌ وَالْبَحْرُ يَمُدُّهُ مِن بَعْدِهِ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ
مَّا نَفِدَتْ كَلِمَٰتُ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٧﴾ مَّا خَلْقُكُمْ
وَلَا بَعْثُكُمْ إِلَّا كَنَفْسٍ وَٰحِدَةٍ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ ﴿٢٨﴾

٤١٣

## پێڵێنانی موشریکەکان بەخالقیەتی خوا:

﴿[٢٥] ولئن سألتهم من خلق السموات والأرض ليقولن الله﴾ ئەگەر لێیان بپرسی: کێ ئاسمانەکان و زەویی دروستکرد؟ بە تەئکید ئەڵێن: خوا ﴿قل الحمد لله﴾ تۆش ئەی موحەممەد ﷺ بڵێ: سوپاس وستاییش بۆ خوا کە ئەوەندە بەڵگەی وەحدانیەتی خۆی بەدیهێناوە، ددان دەدنێن بە خالقییەتیدا ﴿بل أكثرهم لا يعلمون﴾ بەڵام زۆربەیان

نازانن بەو پێلێنانەیان، چون بەڵگەیان لەسەر شێوانی بیروباوەڕی خۆیان راست کردۆتەوە ﴿[٢٦] لله مافى السموات والأرض﴾ هەرچی لەئاسمان وزەویدایە، هەربۆ خوایە بە دروستکردن و موڵك و مشور خۆریی، ئیدی چۆن واز لە عیبادەتی ئەو دێنن؟! ﴿إن الله هو الغنى الحمید﴾ بەڕاستیی ئەوخوایە لەعیبادەتی بەدەکانی بێنیازە، لە زاتی خۆیشیداو لەلای بەندەکانی و دروستکراوەکانی سوپاس کراوە.

**فەرمان و پەیڤینی خوا هەرگیز کۆتایی نایەت:**

دیسان دەچێتەوە سەربەڵگە هێنانەوە بۆ بوون و دەسەڵاتی خۆی و.. ئەفەرمووێ: ﴿[٢٧] ولو ان مافى الأرض من شجرة اقلام﴾ ئەگەر هەرچی داروودرەختی ئەم زەوییە هەیە پینووس و قەڵەم بن ﴿و البحر یمده من بعده سبعة ابحر﴾ دەریاش چەندەیە و ببێتە حەوت ئەوەندەی تریش، مەرەکەفی ئەو قەڵەمانە بن، تەواوی خەڵکیش ببنە نووسەرو کەلیماتی خوای پێ بنووسن قەڵەمەکان کولدەبن و، مەرەکەفەکەش تەواو دەبێت ﴿مانفذت کلمات الله﴾ قسەوکەلیماتەکانی خوا هەرتەواو نابێت ﴿إن الله عزیز حکیم﴾ بەڕاستی خوا زۆر دەسەڵاتدارە، زۆریش وتە دروست و کارجوانە، دیسانەوە هەرئەم مەبەست و مانایە لە سوورەتی(١٩/١٨):(قل لو کان البحر مدادا..) هاتووە. ﴿[٢٨] ماخلقکم ولا بعثکم إلا کنفس واحدة﴾ خەڵکینە! دروستکردن وزیندوکردنەوەی هەمووتان دوای مردن" وەکو دروستکردن وزیندووکردونەوەی تاکەکەسێکە، بەلای خواوە ئەوەندە ئاسانە ﴿إن الله سمیع بصیر﴾ بەڕاستیی خوا زۆر بیسەرو ژنەوایە، زۆریش بینایە ئاگادارەو، هەموو شتێکیش بەوردیی دەبینێ.


الجزء الحادي والعشرون — سورة لقمان

أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يُولِجُ اللَّيْلَ فِي النَّهَارِ وَيُولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِي إِلَىٰ أَجَلٍ مُسَمًّى وَأَنَّ اللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٢٩﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِنْ دُونِهِ الْبَاطِلُ وَأَنَّ اللَّهَ هُوَ الْعَلِيُّ الْكَبِيرُ ﴿٣٠﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ الْفُلْكَ تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِنِعْمَتِ اللَّهِ لِيُرِيَكُمْ مِنْ آيَاتِهِ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿٣١﴾ وَإِذَا غَشِيَهُمْ مَوْجٌ كَالظُّلَلِ دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ فَلَمَّا نَجَّاهُمْ إِلَى الْبَرِّ فَمِنْهُمْ مُقْتَصِدٌ وَمَا يَجْحَدُ بِآيَاتِنَا إِلَّا كُلُّ خَتَّارٍ كَفُورٍ ﴿٣٢﴾ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ وَاخْشَوْا يَوْمًا لَا يَجْزِي وَالِدٌ عَنْ وَلَدِهِ وَلَا مَوْلُودٌ هُوَ جَازٍ عَنْ وَالِدِهِ شَيْئًا إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا وَلَا يَغُرَّنَّكُمْ بِاللَّهِ الْغَرُورُ ﴿٣٣﴾ إِنَّ اللَّهَ عِنْدَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَاذَا تَكْسِبُ غَدًا وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿٣٤﴾

سُورَةُ السَّجْدَةِ

الٓمٓ — ٤١٤

**توانایی و باڵادەستی خوا:**

﴿[٢٩] الم تر ان الله یولج اللیل فى النهار ویولج النهار فى اللیل﴾ ئاخۆ بەچاوی خۆت نەتدیوە کەچۆن خوا لەشەو کەم دەکات وئەیخاتە سەرڕۆژ و، لەڕۆژیش کەم ئەکات دەیخاتە سەرشەو ﴿وسخر الشمس والقمر﴾ و خۆر و هەیڤیشی رام کردووە ﴿کل یجری إلى اجل مسمى﴾ هەریەکەیان هەتا ئەوکاتەی لای خوا بۆی دیاریی کراوە لەسووڕانەوەو گەڕان دەڕواو دێت، واتە: تا ڕۆژی قیامەت دەڕۆن و دێن ﴿إن الله بماتعملون خبیر﴾ بێگومان خوا بەکاروکردەوەی ئێوە بەئاگایە ﴿[٣٠] ذلك بأن الله هو الحق﴾ نیشاندانی ئەو ئاڵوگۆڕو دەسەڵاتە هەر بۆ ئەوەیە ئێوە دڵنیابن کەهەرئەو خوایە ڕاستە ﴿وان ما یدعون من دونه الباطل﴾ بێگومان ئەوەی دەیپەرستن جگە لە خوا نارەواو پوچەڵە. مەبەستی خواکانیشیان جگە لە خوا ﴿وان الله هو العلى الکبیر﴾ و بێگومان ئە خوایە بلندو گەورەیە، واتە: بڵندە، لەو بڵندتر نیە، گەورەیە لە هەموو گەورەیەك ﴿[٣١] الم تر ان الفلك تجرى فى البحر بنعمة الله﴾ ئایا نەتدیوە چۆن بەفەزڵی خوا کەشتییەکان لەجەرگەی دەریاکاندا بەتوانایی‌و رامکردنی خوا دێن و دەچن و دەگەڕێن، دیارە ئەگەرخوا هێزو وزە

بەئاو نەدات هەرگیز ئەو گەمییانەی بۆ هەڵناگیرێ ﴿لیریکم من آیاته﴾ تا هەندێ بەڵگەو دەسەڵاتی خۆیتان نیشان بدات ﴿إن فی ذلك لآیات لكل صبار شكور﴾ بەڕاستیی لەوەی باسکرا گەلێ بەڵگەو نیشانەی گەورە هەیە بۆ هەر خۆڕاگرێکی سوپاسگوزار، واتە: بۆ هەر باوەڕدارێك خۆڕاگرو سپاسگوزار بێت، چونکە خۆڕاگری و سپاسگوزاری دوو سیفەتی بابای ئیماندارە ﴿[٣٢] وإذا غشیهم موج كالظلل﴾ بڕوادار زۆر بەئارام و زۆریش سوپاسگوزارە، کەچی موشریك وهاوبەش دانەرەکان هەرکاتێ شەپۆلیکی گەورەی دەریا وەك هەوری پڕ بت پەرستەکان داپۆشی ﴿دعوا الله مخلصین له الدین﴾ ئەوسا لە خاوێنی لە شیرك و ملکەچی بۆی داوا لەخوا دەکەن و لێیدەپاڕێنەوە ڕزگاریان بکا ﴿فلما نجاهم إلی البر﴾ جا کاتێ ڕزگاری کردن و گەیاندنیە وشکانیی لەسەر ئەو بارەیان ناوەستن. سوورەتی (٦٧/١٧): (وإذا مسکم الضر..) وە سوورەتی (٦/ ٤٠-٤١): (قل أرأیتم إن أتاکم عذاب الله) هەرئەم ماناومەبەستە دەگەیەنێت. ﴿فمنهم مقتصد﴾ هەیانە مامناوەندییە لەنێوان شیرك و یەك خوا پەرستیدان هەشیانە لەسەر شیرك دەمێنێتەوە ﴿وما یجحد بآیاتنا إلا كل ختار كفور﴾ لەئایەتەکانمان نکوولی ناکات مەگین خەڵکێکی فریوباز وپێنەزان ﴿[٣٣] یا أیها الناس اتقوا ربكم﴾ ئەی خەڵکینە! خۆتان لەسەرپێچی پەروەردگار بپارێزن و فەرمانەکانی جێبەجێ بکەن و لێی بترسن ﴿واخشوا یوما لا یجزی والد عن ولده﴾ و لەو ڕۆژەش بترسن کەهیچ باوکێ هیچی لەدەس نایە بۆ کوڕی خۆی ﴿ولا مولود هو جاز عن والده شیئا﴾ و هیچ منداڵێکیش هیچی پێناکرێ بۆ باوکی خۆی. واتە: تکاو لاڵەو پارانەوە لەو ڕۆژەدا بەکردەوەی چاك نەبێت کەڵکێکی نیە، بۆیە تەنانەتی منداڵیش فریای باوکی خۆی ناکەوێت ﴿إن وعدالله حق﴾ بێگومان بەڵێنی خوا بەهاتنی ڕۆژی قیامەت ڕاستە ﴿فلا تغرنكم الحیاة الدنیا﴾ وریا بن! ژیانی ئەم دونیایە فریوتان نەدات ﴿ولا یغرنكم بالله الغرور﴾ نەفس و شەیتانیش بە مۆڵەتدانی خوا چەواشەو سەرگەردانتان نەکاو فریوتان نەدا، وەك ئەم ئایەتەیش دەفەرموێ: (یعدهم و یمنیهم وما یعدهم الشیطان إلا غرورا).

### هەر خوا زانای گشت باو بارانێکە:

ئینجا خوا باسی پێنج شت ئەکات کەتەنها هەر خۆی ئەیانزانێ:

١- ﴿[٣٤] إن الله عنده علم الساعة﴾ بەڕاستیی زانیاریی هاتنی ڕۆژی قیامەت هەرلای خوایە، جگە لەو هیچ کەسێك نازانێ قیامەت کەی دێت، وەك لەجێگای تردا دەفەرموێ: (لا یجلیها لوقتها إلا هو) ١٨٧/٧.

٢- ﴿و ینزل الغیث﴾ تەنها ئەویش باران ئەبارێنی لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا، کەسێکی تر ناتوانێ باران ببارێنێ.

٣- ﴿ویعلم ما فی الأرحام﴾ ئەویش ئەزانێ چی لە منداڵدانەکاندایە، واتە: هەر لەوکاتەوە کەهێشمان ئاوە، خوا خۆی دەزانێ چییە: کوڕە یان کچ، بەختیارو سەرفرازە، یان لاسارو بەدبەختە، بەژن و باڵای کورتە، یا..هتد.

٤- ﴿وما تدری نفس ماذا تكسب غدا﴾ هیچ کەسێك - نە چاکەکار و نەخراپەکار- سەد لەسەد نازانێت سبەینێ چی دەکا لەچاك و لەخراپ.

٥- ﴿وما تدری نفس بأی أرض تموت﴾ هیچ کەسیش نازانێ لەکام سەرزەویی ئەمرێ، واتە: کام جێگا دەبێتە گۆڕو ئارامگای، هەرچەند لەوانەیە هەوڵیش درابێ بۆ زانینی ئەمە! ﴿إن الله علیم خبیر﴾ چونکە هەر خوایە زانا و

بەئاگایە بەتەواوی ڕووداوەکان و گشت نهێنی و ئاشکرایەکیشی لایەکسانە. (وعنده مفاتح الغيب لا يعلمها إلا هو..)، (٥٩/٦) هەر بۆ دووپاتی ئەم ماناو مەبەستەیە.

**کۆتایی تەفسیری سوورەتی لوقمان، لەگەڵ سوپاسی زۆرمدا.**

**والحمد لله والمنة.**

*** *** ***

## ٣٢- سوورەی ( سەجدە )یە

## مەککەییەو ( ٣٠ ) ئایەتە

الجزء الحادي والعشرون　　سورة السجدة

بسم الله الرحمن الرحيم

الم ﴿١﴾ تنزيل الكتاب لا ريب فيه من رب العالمين
﴿٢﴾ أم يقولون افتراه بل هو الحق من ربك لتنذر قوما
ما أتاهم من نذير من قبلك لعلهم يهتدون ﴿٣﴾ الله
الذي خلق السماوات والأرض وما بينهما في ستة أيام
ثم استوى على العرش ما لكم من دونه من ولي ولا شفيع أفلا
تتذكرون ﴿٤﴾ يدبر الأمر من السماء إلى الأرض ثم يعرج
إليه في يوم كان مقداره ألف سنة مما تعدون ﴿٥﴾ ذلك
عالم الغيب والشهادة العزيز الرحيم ﴿٦﴾ الذي أحسن
كل شيء خلقه وبدأ خلق الإنسان من طين ﴿٧﴾ ثم جعل
نسله من سلالة من ماء مهين ﴿٨﴾ ثم سواه ونفخ فيه
من روحه وجعل لكم السمع والأبصار والأفئدة قليلا
ما تشكرون ﴿٩﴾ وقالوا أإذا ضللنا في الأرض أإنا لفي
خلق جديد بل هم بلقاء ربهم كافرون ﴿١٠﴾ ۞ قل يتوفاكم
ملك الموت الذي وكل بكم ثم إلى ربكم ترجعون ﴿١١﴾

ربع الحزب ٤٢

٤١٥

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتەیش وەك سوورەتە هاو وێنەکانی خۆی چارەسەری بنەماو بناغەی عەقیدەی ئیسلامیی دەکات، وەك: بڕوا بەخوا و، بە پەیامی پەیامبەران و، بە زیندووبوونەوەو پاداش وتۆڵە.. لەدوای سوورەتی (مؤمنون)ـەوە هاتووە، گەلێ بەڵگەش بۆ یەکتاپەرستیی دێنێتەوە، راوبۆچوونی هاوبەشدانەرەکان سەبارەت بە نکووڵی کردنیان بۆ زیندوو بونەوە ڕەتدەکاتەوە" کۆتاییەکەیشی بەباسێکی ڕۆژی حیساب و کیتاب و لێکۆڵینەوە دێت.

### بێ شك قورئان خوا ناردوویەتی:

﴿بسم الله الرحمن الحيم * [١] الم﴾ واتە: ئەم قورئانە هەر لەم پیتانە پێکهاتووە، کەچی ئاوایش یەکی ئێوەی خستووەو، پێتان دەڵێت: دەسا ئەگەر دەتوانن نموونەی بێنن، فەرموون وێنە و نموونەی بێنن! ﴿[٢] تنزيل الكتاب لا ريب فيه من رب العالمين﴾ هیچ گومانی تێدا نییە کەلەلایەن پەروەردگاری جیهانەکانەوە ,بەشبەش دابەزێنراوەتە خوارەوە، واتە: ئەر کەسێ لەمەدا بەگومان و دوودڵ بێت، کارێکی زۆر نابەجێ و ناڕەوایکردووە ﴿[٣] ام يقولون افتراه﴾ یا کافرو خوانەناسەکان دەڵێن: موحەممەد خۆی هەڵیبەستووە؟بۆیان نیە ئەوە بڵێن ﴿بل هو الحق من ربك﴾ بەڵکو ئەو هەقەیە لە لایەن پەروەردگارتەوە ڕەوانە کراوە ﴿لتنذر قوما ماأتيهم من نذير من قبلك﴾ هەتا تۆئەو قەومەیە بترسێنیٚ ,کە پێش تۆ هیچ بێدارکەرەوەیەکیان بۆ نەهاتووە، دیارەکە خوا سزای هیچ کەسێ نادات بێ بەڵگەو بێدارکەرەوە، هەروەك بەڕاشکاوی لەسوورەتی (١٥/١٧)دا ئەمە ڕادەگەیەنێ ودەفەرموێ: (وما كنا معذبين حتى نبعث رسولا). ﴿لعلهم يهتدون﴾ هەتابەشکو ئەوانە شارەزاو ڕێنمابن و ڕێگەی حەق و ڕاست دەرك بکەن و سەر لێشێواو نەبن.

## ئاسمان و زەویی ونێوانیان, بەشەش ڕۆژان خوڵقێنراون:

﴿[٤] الله الذی خلق السموات والأرض وما بینهما فی ستة ایام﴾ ئەو خوایەئاسمانەکان وزەویـی و هەرچیش لەنێوانیاندایـە لـەماوەی شـەش ڕۆژ (دەوەران)دا بـەدی هێنـا ﴿ثم استوی علی العرش﴾ لەپاشـان چـوویە سـەر عـەرش،ئیمانمان بـە(ئیسـتیوا)هەیـە, بـەڵام ئیسـتیوایەك لایـەقی شـکومەندی خـۆی بێـت , واتـە: بـیٚ هـیچ جـۆرە بیرکردنـەوەو شـوبهاندن و دەسـتکارییەك لەشـێوازی ئەوچـوونە سـەر عەرشـەی. جـا مەبەسـت بـەم (إسـتواء)یـە لـە جێگاکانی تردا بە ئەندازەی تواناو لێزانینی خۆمان قسەی لەسەر کراوە، (سەلەف) وپێشینانیشمان لە تەفسیرو مانای((إستوی علی العرش))دا دەڵێن: (أی علا علی الأرض، علوا یلیق بجلاله من غیر تجسیم ولا تکییف ولا تشبیه ولا تعطیل..) شیاوی ئاماژە بۆکردنە لە سوورەتی(ئەعراف) وجێگاکانی تردا سەبارەت بەم مەسەلەیە زیاتر قسەمان کردووە، دەتوانی بچیتەوە ئەویٚ. ﴿مالکم من دونه من ولی ولا شفیع﴾ ئەی کافران! بۆتان نیە هیچ دۆست وتکا کارێك -جگە لەخۆی- لەسزا ڕزگارتان بکات ﴿افلا تتذکرون﴾ دەئایا ئامۆژگاری وەرناگرن و لەسەر کوفرو شیرکی خۆتان بەردەوام دەبن؟! ﴿یدبر الأمر من السماء إلی الأرض﴾ ئەوخوایەیە کەلە سەرووی ئاسمانەوە بۆ زەویی, کارو باری خەڵك دەبر دەکات, وەکو دەفەرمویٚ: (الله الذی خلق سبع سموات ومن الأرض مثلهن یتنزل الأمر بینهن..). ﴿ثم یعرج إلیه﴾ لەپاشان بەرز ئەبنەوە بۆلای خۆی ﴿فی یوم کان مقداره الف سنة مما تعدون﴾ لەڕۆژێکدا کە بەپێی ژماردنی ئێوە یەك هەزار ساڵە، واتە: لەبەر قورسیی وسەختیی، ماوەکەی ئەوەندەی یـەك هەزارسـاڵ درێژە.وە ئـەم ڕۆژە ڕۆژێکـە لـەڕۆژەکانی قیامـەت. سـوورەتی (١٢/٦٥): (الله الـذی خلـق سـبع سمـوات..) بۆهـەمان مانایـە، وە (٤٧/٢٢): (وإن یومـا عنـد ربك کـألف سنة). (ئـیبن عـەبباس) ئـەڵێت: ئـەو هـەزار ڕۆژەش کەلـە سـوورەتی (حـەج)دا باسکراوە , تەنهاڕۆژێکە لەو شەش ڕۆژەیە, کە خـوا ئاسمانەکان وزەویـی لـە شـەش ڕۆژانـدا دروسـتکرد، ئـەم هـەزار ڕۆژەش لە سوورەتی (سەجدە)دا, ماوەی سەرکەوتن وڕۆیشتنی ڕووداوو فەرمان وکاروبارەکانە بۆلای خوا -جل جلالە-,پەنجا هەزار ڕۆژەکەیش ڕۆژی قیامەتە، هەندێکیش ئەڵێن: مەبەست لـە هەرسـیٚ هـەزارەی سوورەتەکان هـەر ڕۆژی قیامەتە. ئەو جیاوازییەش بە پێی پلەی ئیمان وباوەڕە، وەك ئەفەرمویٚ: (فذلك یوم عسیر، علی الکفرین غیر یسیر) (٧٥/٩-١٠)، یان دەفەرمویٚ: (ویقول الکافرون هذا یوم عسر) (٨/٥٤). ﴿[٦] ذلك عالم الغیب والشهادة العزیز الرحیم﴾ ئەو خاوەنی پەسنانە, زانای نادیارو دیارە,دەسەڵاتدارو میهرەبانە. زانایە بەهەموو شتێکی نادیارو دیار, دەسەڵاتدارو بەتوانایە، زۆر میهرەبان ودلاواو بە بەزەییە.

## قۆناغەکانی ئافەراندنی مرۆڤ:

﴿[٧] الـذی أحسـن کـل شـئ خلقـه﴾ ئەوخوایـە هـەموو شـتێکی دروسـتکراوی خـۆی, بەچـاکی وڕێـك وپێکـی دروستکردووە، واتە: هەموو شتێك لە جێگەی شیاوی خۆیدا فەراهەمی هێناوە ﴿وبدأ خلق الانسان من طین﴾ وە دروستکردنی مرۆڤ (ئادەم)ی‌لە قوڕەوە دەست پێکرد,، واتە: بۆ هەوەڵجار باوکی مرۆڤی لە قوڕێك دروستکرد، بەو شێوەیەکە لـە گـەلیٚ جێگـای تـردا باسـکراوە ﴿[٨] ثـم جعـل نسـله مـن سـلالة مـن مـاء مهـین﴾ لەپاشا نەوەکەشـی لـە پاڵاوتەیـەك, لـە ئـاوێکی بێهێـز دروسـتکرد، واتـە: لەپاڵاوتـەی ئـاوی ژن وپیـاو-وەکـو لەهێنـدیٚ سـوورەتی تـردا تێپەڕی- بەدیهێنان ﴿[٩] ثم سواه ونفخ فیه من روحه﴾ لە پاشا بەژن و باڵای ڕێك وپێککرد و هەر لە سکی دایکیا, لە ڕۆحی خۆی گیانی کرد بەبەریا ﴿وجعل لکم السمع والأبصار والأفئدة﴾ وە گویٚ و چاوو دڵی, واتە: دەزگای هێزی بیستن وبینین وئامێری دڵی بۆدانان ﴿قلیلا ماتشکرون﴾ کەچی زۆر کەمتان سوپاسگوزاری دەکەن.

**قیامەت بە دوور مەزانن:**

﴿[١٠] **وقالوا إذا ضللنا فی الأرض**﴾ لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگانەدا هێمان ئەوبێ باوەڕانە وتیان:ئایا ئەگەر ئێمە مردین و لەناخی زەوییدا بزر بووین و تیا چووین و بووینەوە گڵ ﴿**إنا لفی خلق جدید**﴾ ئایا جارێکی تر سەر لەنوێ دروستدەکرێنەوە,واتە: زیندوو دەبینەوە؟ ﴿**بل هم بلقاء ربهم کافرون**﴾ ئەوان هەر تەنیا ئینکاری ژیانەوە ناکەن, بەڵکو باوەڕیان بە دیدارو خزمەتگەیشتنی پەروەردگاریان نییە، بۆیە پێیان وایە کە هەرگیز زیندوو ناکرێنەوەو بێ حیساب و کیتاب دەبن! ﴿[١١] **قل یتوفاکم ملك الموت الذی وکل بکم**﴾ بەو بێ باوەڕانە بڵێ: ئەوفریشتەیەی گیان کێشانتانی پێ سپێرراوە, گیانتان دەکێشێ ودەمرن. ئەم ئایەتە وا ئەگەیەنێت کە فریشتەی گیانکێشان یەك فریشتە بێت، زانایانی (سەلەف)یش دەڵێن! ئەو فریشتەیەش ناوی (عیزرائیل)ـە، کەچی لە سوورەتی (٤/٩٧)، (٢٧/٤٧)، (٦/٦١) وانیشان دەدرێت کە فریشتەی گیانکێشان زۆر بن! جا بۆ ئەمە زانایان دەڵێن لە بنەڕەتدا ئەو فریشتە کە ئەوکارەی پێ سپێراوە تاکە فریشتەیەکە، بەڵام چەند فریشتەیەکی تر لەبەر دەستییدان. ﴿**ثم إلی ربکم ترجعون**﴾ لە پاشان هەر بۆ لای پەروەردگارتان دەگەڕێنەوەو پاداش و تۆڵە وەردەگرن.

**حاڵی بەدحاڵی موشریکان:**

﴿[١٢] **ولو تری إذ المجرمون ناکسوا رؤوسهم عند ربهم**﴾ لە ڕۆژی قیامەتدا,ئەر ببینی کاتێ تاوانبارەکان لە لای پەروەردگاری خۆیان ,سەریان شۆڕکردووە لە خەجاڵەتیدا ﴿**ربنا أبصرنا وسمعنا**﴾ بەزەلیلی ئەڵێن: پەروەردگارمان! ئەوەی بەڵێنت پێدا بووین وا ئێستا بە چاوی خۆمان بینیمان و بەگوێی خۆمان بیستمان ﴿**فارجعنا نعمل صالحا**﴾ پەشیمانین، دە بمانگێڕەوە بۆ دونیا, مەرج بێت هەرکاری چاك ئەنجامبدەین ﴿**إنا موقنون**﴾ بەڕاستیی ئێمە یەقینمان هەیە،"و ئەزانین کە بەڵێنەکەت ڕاستە. جا هەر ئەم مانا ومەبەستەیە لەسوورەتی (ئەعراف/٥٣) وە لە سوورەتی (مەریەم/٣٨)دا ڕوون کراوەتەوە.

سُورَةُ السَّجْدَةِ — الجُزءُ الحَادِي وَالعِشرُونَ

وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلْمُجْرِمُونَ نَاكِسُوا۟ رُءُوسِهِمْ عِندَ رَبِّهِمْ رَبَّنَآ أَبْصَرْنَا وَسَمِعْنَا فَٱرْجِعْنَا نَعْمَلْ صَٰلِحًا إِنَّا مُوقِنُونَ ﴿١٢﴾ وَلَوْ شِئْنَا لَءَاتَيْنَا كُلَّ نَفْسٍ هُدَىٰهَا وَلَٰكِنْ حَقَّ ٱلْقَوْلُ مِنِّى لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿١٣﴾ فَذُوقُوا۟ بِمَا نَسِيتُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَآ إِنَّا نَسِينَٰكُمْ وَذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْخُلْدِ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٤﴾ إِنَّمَا يُؤْمِنُ بِـَٔايَٰتِنَا ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا۟ بِهَا خَرُّوا۟ سُجَّدًا وَسَبَّحُوا۟ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ۩ ﴿١٥﴾ تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿١٦﴾ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِىَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٧﴾ أَفَمَن كَانَ مُؤْمِنًا كَمَن كَانَ فَاسِقًا لَّا يَسْتَوُۥنَ ﴿١٨﴾ أَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَلَهُمْ جَنَّٰتُ ٱلْمَأْوَىٰ نُزُلًۢا بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٩﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فَسَقُوا۟ فَمَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ كُلَّمَآ أَرَادُوٓا۟ أَن يَخْرُجُوا۟ مِنْهَآ أُعِيدُوا۟ فِيهَا وَقِيلَ لَهُمْ ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلنَّارِ ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿٢٠﴾

٤١٦ وَلَنُذِيقَنَّهُم

ئەوانە کە سزای قیامەت دەبینن، لەخوا داوای گەڕانەوەی دنیا ئەکەن، هەتا ئەمجارە کارو کردەوەی چاك بکەن،خواش دەفەرموێ: ﴿[١٣] **ولوشئنا لآتینا کل نفس هداها**﴾ ئەر ویستبامان بە زۆر هەموو کەسێك بێنینە سەر ڕێی هیدایەت، ئەوا هەموو کەسێکمان بە زۆر دەهێنایە سەر ڕێی ڕاست و، هیدایەتمان دەدا، دیارە ئەوەش پێچەوانەی ئازادیی و، سەربەستییەکە خوا بە مرۆڤی داوە ﴿**ولکن حق القول منی لأملأن جهنم من الجنة والناس أجمعین**﴾ "ئەگەر بمان ویستبا ئاوامان دەکرد, بەڵام گفتەکە لەمنەوە سابت بووە کە:دەبێ دۆزەخ پڕبکەم لە جنیی ولە ئادەمیی,هەموو لەبەر زانینمان بەوەی کە ڕێگەی چەوت و گومڕایی هەڵدەبژێرن و,هیچ بەڵگەو نیشانەو

ئامۆژگارییەك كارییان تێ ناكات. سوورەتی (یونس/٩٩) ئەو ڕاستیە دووپات دەكاتەوە و دەسەلمێنێت. ﴿١٤ فذوقوا بما نسیتم لقاء یومكم هذا﴾ جا(پێیان دەڵێن):ئەمڕۆ ئێوە ئەم سزایە بچێژن لەبەر ئەوەی كە گەیشتن ولیقای ئەمڕۆكەتان لەبیر كرد ﴿إنا نسیناكم﴾ دڵنیابن كە ئێمەش ئێوەمان لەبیر كرد لەناو سزادا ﴿وذوقوا عذاب الخلد بما كنتم تعلمون﴾ وە ئیدی سزای هەتا هەتایی و نەبڕاوە بچێژن بە هۆی كارو كردەوەكانتانەوە.

**مرۆڤی بە بڕوا هەركە ئایەتی خوایان وەبیر هێنایەوە، بەسەجدە دەكەوێتە عەرزێ:**

﴿١٥ إنما یؤمن بآیاتنا الذین إذا ذكروا بها خروا سجدا﴾ بەڕاستیی هەر ئەوانە بڕوا بەئایەتەكانمان دەكەن كە كاتێ ئامۆژگارییان پێدەكرێن ,شۆڕدەبنەوە سەر زەوی بە كڕنووش بردن، واتە: خۆیان ئامادەییەكی باشیان تێدایەو، هەوڵیش دەدەن لێیان تێ بگەن ﴿وسبحوا بحمد ربهم﴾ تەسبیحی دەكەن لە هەرشتێك كە لایقی نەبێ, هاوڕێ لە گەڵ سوپاسكردنی پەروەردگاریاندا ﴿وهم لا یستكبرون﴾ وبە هیچ شێوەیەكیش فیزو تەكەبور ناكەن و, خۆیان بەزل دانانێن,لە عیبادەت بۆی,بە پێچەوانەی ئەوانەی تەكەببور دەكەن, لەجێگایەكی تردا خوا دەفەرموێ: (إن الذین یستكبرون عن عبادتی سیدخلون جهنم داخرین) (٤٠/٦٠). ﴿١٦ تتجافی جنوبهم عن المضاجع﴾ كەلەكەو تەنیشتیان ,بەجێونوێنەكانیانەوە دوورە , واتە: لەبەر عیبادەت وشەونوێژ ,سەرلەسەرین نانێن و خەویان نیە ﴿یدعون ربهم خوفا وطمعا﴾ بەترس و بە ئومێدەوە پەروەردگاری خۆیان دەپرستن، واتە:نوێژی شەودەكەن, بەترس لە سزای خواو,بە ئومیدبە رەحمەتی وبەزەیی.(مەعان) دەڵێ: گوتم بەپێغەمبەر ﷺ كارێكم فێركە بمباتەبەهەشتەوە! فەرمووی: بەتاك و تەنیا خوا بپەرستەو،هاوەڵی بۆ دانەنێیت، نوێژ بكەو زەكات بدەو، ڕۆژو بگرەو حەجی كابە بكە، پاشان هەوڵبدە لەم ڕێگانەشەوە بەردەوام كاری چاكەبكە: ڕۆژووبگرە، چوونكە ڕۆژو قەڵغانە، خێرو صەدەقە گوناح وتاوان دەسڕێتەوە، شەونوێژ لە ناو جەرگەی شەودا، پاشان ئایەتی: (تتجافی جنوبهم عن المضاجع) هەتا(جزاء بما كانوا یعملون) ی خوێندەوە.﴿ومما رزقناهم ینفقون﴾ و لەو ڕزق و ڕۆزییەی پێمان بەخشیون، لە ڕێگای خوادا(لە جیهاددا) دەبەخشن ﴿١٧ فلا تعلم نفس ما اخفی لهم من قرة اعین﴾ ئیتر هیچ كەسێك نازانێ چ پاداشتێكی گرنگیان بۆ داشاراوە لە هۆیەكانیخۆش وشادی چاوان ودڵئارامی ﴿جزاء بما كانوا یعملون﴾ لە پاداشی ئەو كارانەدا ئەنجامیانداون و، خۆیانیان بۆ ماندووكردووە.

**بڕوادارو لادەر وەك یەك نین:**

﴿١٨ افمن كان مؤمنا كمن كان فاسقا﴾ ئایا ئەوكەسەی بڕوای هێناوە وەك ئەوكەسە وایە كە لە ئیمان دەرچووە! ﴿لا یستوون﴾ بێگومان هەرگیز ئەو دووانە چوونیەك نین ﴿اما الذین امنوا وعملوا الصالحات﴾ ئەوانەی بە باوەڕبوون وكارەچاكە كانیان كرد﴿فلهم جنات المأوی﴾ ئەنواو شوێنیان چەند باخێكیبەهەشتی هەمیشەییە ﴿نزلا بما كانوا یعملون﴾ لەو بەهەشتەدا دادەبەزن و دەبنە میوان لەبەرامبەر ئەو كارانەوە كردوویانە ﴿٢٠ واما الذین فسقوا فمأواهم النار﴾ ئەوانەش لە ئیمان دەرچوون,جێ وماوایان ئاگرە ﴿كلما ارادوا ان یخرجوا منها﴾ هەر كات بخوازن لەوئاگرە دەرچن وبڕۆنە دەرەوە بەهەر شێوەیەك كە عەقڵیان بیبڕێ ﴿اعیدوا فیها﴾ ئەیانگێڕنەوە ناوئاگرەكە ﴿وقیل ذوقوا عذاب النار الذی كنتم به تكذبون﴾ وپێیان ئەوترێ: دەبچێژن سزای ئاگرێك كەئێوە نكوڵیتان ئەكردو بڕواتان پێینەبوو ﴿٢١ ولنذیقنهم من العذاب الأدنی دون العذاب الأكبر﴾ وە دەبێ لە سزای دنیایان پێبچێژین (بەقات و قڕیی وبەلا)، پێش سزا گەورەكەی ڕۆژیقیامەت ﴿لعلهم یرجعون﴾ بەشكوم بگەڕێنەوە لە لادان لەكوفرو بێباوەڕیی ﴿٢٢ ومن أظلم ممن ذكر بآیات ربه﴾ كێ لەوكەسە ستەمكار ترە كە بەئایەتەكانی پەروەردگاری

ئامۆژگاریی دەکرێت ﴿ثم اعرض عنها﴾ کەچی روویان لێوەرچەرخێنێت؟ ﴿إنا من المجرمين منتقمون﴾ ئەوانە تاوانبارن ,بەڕاستیی ئێمەش تۆڵە لە تاوانباران ئەسێنین، ئایەتی٥٧/ سوورەتی (الکهف) هەر بۆ پشتگیری ئەم مەبەستەیە.

**کتێبی موساو ڕێبەری بەنی ئیسرائیل:**

﴿[٢٣] ولقد آتينا موسى الكتاب﴾ بەڕاستی ئێمە کتێبی تەوراتمان بەمووسادا ﴿فلا تكن في مرية من لقائه﴾ جا تۆش ئەی محمد ﷺ هیچ گومانت نەبێ ودوودڵ مەبە لەدیداری موساو، لەوەش کە تەورات لەلایەن ئێمەوە بەخشراوە بەو﴿وجعلناه هدى لبني إسرائيل﴾ کردیشمانە ڕێ نیشاندەر بۆ نەوەکانی یەعقووب ﴿[٢٤] وجعلنا منهم



ائمة يهدون بأمرنا لما صبروا﴾ وچەند کەسێکمان لێکردنە سەرکردەو پێشەوا,چونکە لە ئایندەدا -بە فەرمانی خۆمان- ڕێنموونی خەڵکیان دەکردو، صەبروئارامیان گرت وشانیان دایە بەرئەو ئەزیەت وئازارە هاتە ڕێگەیان ﴿وكانوا بآياتنا يوقنون﴾ وە یەقینیشیان بەئایەتەکانی ئێمە هەبوو﴿[٢٥] إن ربك هو يفصل بينهم يوم القيامة فيما كانوا فيه يختلفون﴾ و پەروەردگاری تۆ لەڕۆژی قیامەتدا بۆخۆی, لەیەکیان دەکاتەوە لەوەی مشت ومڕیان تێیدا هەبوو، لە کارو باری ئایین,بە حوکم وبڕیاردان لەنێوانیاندا, ئەوکات چاك وخراپ، ڕاست وناڕاست ڕوون ئەبێتەوە.

**چەندبەڵگەیەك لەسەردەسەلاتی خوا:**

﴿[٢٦] اولم يهد لهم كم أهلكنا من قبلهم من القرون﴾ ئایا بۆیان روون نەبۆتەوە,کە چەند خەڵکمان لەپێشیانەوە لەناوبردووە؟ ئەبوو پەندیان لێوەرگرتایە﴿يمشون في مساكنهم﴾ لە کاتێکدا ئەمان(قورەیش) بەناوخانووە وێرانەکانیاندا دەڕۆشتن و دەگەڕان؟! ﴿إن في ذلك لآيات﴾ بەڕاستیی ئالەو دیاردانەدا گەلێ بەڵگەی زۆربەهێز هەیە بۆ دەسەڵاتی ئێمە ﴿افلا يسمعون﴾ دەئایا نابیسن؟ ﴿[٢٧] اولم يروا انا نسوق الماء إلى الأرض الجرز﴾ ئایا نەیان بینیوە کە ئێمە بۆ زەویی کراڵ و وشك ومردووو بێگیان، ئاودەنێرین؟ ﴿فنخرج به زرعا تاكل منه انعامهم وانفسهم﴾ ئینجائێمەش بەوئاوە جۆراوجۆری ڕووەك وگژوگیاو مەزراو بەروبوو دەڕوێنین, مەڕوماڵاتەکانیان و، خۆیانیش لێی دەخۆن ﴿افلا يبصرون﴾ دە ئایا نابینن؟.پەلەکردنی کافران بۆ سزاو وەڵامەکەیان:

﴿[٢٨] ويقولون متى هذا الفتح إن كنتم صادقين﴾ بێباوەڕەکان بەلاقرتی و گاڵتەوە دەیانوت: ئەگەر ئێوە ڕاست ئەکەن, ئەم داوەرییەو بڕیاردانە لە نێوانماندا کەی دەبێت؟! ﴿[٢٩] قل يوم الفتح لا ينفع الذين كفروا إيمانهم﴾ پێیان بڵێ:ڕۆژی داوەریی و بڕیاردان, باوەڕشهێنان سوود نابەخشێ بەکافرو بێباوەڕان، دیارە ئەو ڕۆژە ڕۆژی قیامەتە، مەبەست بڕانەوەی کێشەکان وداوەری نێوانیانە، جائەو ڕۆژە موسڵمانان یارمەتی دەدرێن وزاڵ دەبن. ﴿ولاهم

ینظرون﴾ مۆڵەتیش نادرێن بە پەشیمان بوونەوە و بیانوو هێنانەوە ﴿[٣٠] فأعرض عنهم﴾ جاکەوایە تۆ ڕوویان لێ وەرگێڕەو وازیان لێبێنە ﴿وانتظر إنهم منتظرون﴾ وچاوەڕوانی سەرکەوتنبە بزانە چییان بەسەردێت، دیارە ئەوانیش چاوەڕوانن چی تووشی تۆ ببێت" تادەرکەوێ کێ ئەیباتەوە؟ بەڵێ..لەچەند شوێنێکی تردا ئەم ماناومەبەستەیە هاتووە، وەك سوورەتی (٥٢/٣٠- ٣١) وە سوورەتی (٦/١٥٨)و.. هتد.

کۆتایی تەفسیری سوورەتی (سەجدە) هات , لەتەك سوپاسی زۆریشمان بۆخوای دلۆڤان و لەکارزان.

ولله الحمد والمنة.

*** *** ***

## ٣٣- سوورەتی ( ئەحزاب )ـە

## مەدەنییەو ( ٧٣ ) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتەش وەك سوورەتە مەدەنییەکانی تر ,چەمکێکی یاسای کۆمەڵ وکۆمەڵگەی ئیسلامیی دەردەخات، ژیانی تاك و، ژیانی کۆمەڵ وتێکرای موسڵمانان، بەتایبەتی کاروباری خێزان و ئوسرە دەخاتەڕوو.. تا ببێتە دەسەبەری ژیانێکی سەرفرازیی و، سەربلوندیی کۆمەڵگەکە، هاوکات لەگەڵ هەڵوەشاندنەوەی هەندێ باوونەریتی جاهیلیەت و نەفامیی پێش ئیسلام،وەکو باوی بەکوڕ کردن (تەبەننی)، ئینجا باسی (ظیهار)و قایەلبوونیان بەدوودڵ بۆتەنها مرۆڤێك! وە هەروەها لەخووە پیس ونەگریسەکانی تری کۆمەڵگەی نەفامیی پاکژوخاوێندەکاتەوە، دەیشتوانین باسە گرنگەکانی ئەم سوورەتە لەم سێ خاڵەدا کورت بکەینەوە:

یەکەم: ئاڕاستەو بەکار هێنانی ئەدەب و ویڵی ئیسلامیی لە تەواوی کارو باردا بۆنموونە: لەبەشێکی ئاڕاستەوئەدەب و ویڵی ئیسلامییە: ئەدەب و ویڵی شادیی و زەماوەند گێڕان ووەلیمە، خۆداپۆشین وجل وبەرگی ئیسلامیی و، خۆ دەرنەخستن بەڕوو تیی وبێ حیجابیی. شێوەی مامەڵەکردن لەگەڵ پەیامبەردا ﷺ ئەمانەو چەندین ئەحکامیتری کۆمەڵایەتیی، وەکو حوکمی(ظیهار)و، هەڵوەشاندنەوەی یاسای بەکوڕکردن ومیراتیی و، ڕێپێدان بۆمارەکردنیژنی بەکوڕکراوو، حیکمەت لەفرەژنی پەیامبەرداوﷺ، دروودو صەڵاوات ناردن بۆ سەرگیانی پاکیی، باسێکی شەڕەکانی خەندەق وگروپەکان لەگەڵ باسکردنی شێوەی کۆبوونەوەو پەلاماری دڕندانەیان بۆسەر موسڵمانەکان ودەرخستنی نیازو مەبەستی گلاوی دووڕووەکان و، پەشیمان کردنەوەی خەڵکێکی زۆر لەسەنگەری جیهادوتێکۆشان.. مافی خۆیەتی کەئەگەر سوورەتەکە لەسەرەتاوکۆتاییدا بە درێژە لە کاری گەندەڵی دوو ڕووەکان بدوێ،هەتا پەردەی خیانەتەکانیان بۆ هەمووکەسێك لادا. لەتەك باسێکی جەنگی (بەنی قوڕەیزە)و هەڵوەشاندنەوەی پەیماننامەکە لەلایەن جوولەکەکانەوە.

دووەم: بڕیارو فەرمانەکانی خوا.

سێ یەم: (بەنی قورەیزە)و گروپ وحیزبەکان.

### بۆ دینی خوا کۆڵنەدەر بە:

﴿بسم الله الرحمن الرحیم* [١] یاأیها النبی اتق الله﴾ ئەی پەیامبەر!ﷺ بەردەوامبە لە سەر ترسی خودا، پیاوچاکێك لەپێناسەی تەقوادا دەڵێ: تەقوا ئەوەیە هەتادەگەیتە نووری خوا گوێڕایەڵ و بەرفەرمان بێ و، هیوات بە پاداشتی فراوانی خواهەبێ، وە هەرلەبەر ڕووناکیی (نووری)خوادا لەتاوان وتاوانکاری دوورەوەکەوی و،

بەردەوامیش ترسی سزاو تۆڵەی خوات ببێ ﴿ولا تطع الكافرين والمنافقين﴾ وەهەرگیز لەبێباوەڕودووڕووەکان گوێڕایەڵی مەکە ﴿إن الله كان عليما حكيما﴾ چونکە خوا هەمیشە زانایەکی دانایە، واتە:زانایە بە هەموو شت و زانینی ئەو دەوری هەمووشتێکی داوە, دانایە لەوتارو کرداریداو هەمووتارو کرداری لەجێی خۆی دادەنێ,دەی کەوایە هەر گوێڕایەڵی خوا بکە ﴿٢ واتبع ما يوحى إليك من ربك﴾ و شوێنی ئەو بڕیارو فەرمانە بکەوە لەلایەن پەروەردگارتەوە وەحیت بۆدەکرێ ﴿إن الله كا بما تعملون خبيرا﴾ چونکە بەڕاستیی خوا بەردەوام بەوکاروکردەوە ئێوە ئەنجامی دەدەن بە ئاگایەو،هەر بەپێی ئەوەیش پاداش وتۆڵەتان دەدا ﴿٣ وتوكل على الله﴾ و لە تەواوی ئیش و کارەکانیشتدا تەنها پشت بە خوا ببەستە ﴿وكفى بالله وكيلا﴾ ودیارەخواش بۆ چاودێرو بریکارو پشتیوانیی بەسە. (ئیبن جەریر)و(ترمزی) ئەڵێن: دووڕووەکان گوتیان: پێغەمبەر دوو دڵی هەیە! جابۆ وەڵامی ئەو بۆ چوونەیەخوا فەرمووی: ﴿ماجعل الله لرجل من قلبين فى جوفه﴾ خوا لە ناوهەناوو دەروونی هیچ مرۆڤێکدا دوودڵی دانەناوە، کەوایە نابێ دووبیرو باوەڕیش لە تاکە دڵێکدا جێی بکرێتەوە.

**هەڵوەشاندنەوەی باوی بەکوڕ کردن ( تەبەننی! ):**

﴿٤ وما جعل أزواجكم اللائى تظاهرون منهن أمهاتكم﴾ ژنانی هاوسەریشتان کە ئێوە دەیانکەنە دایکی خۆتان و، پێیان دەڵێن: پشتی ئێوە وەك پشتی دایکم وایە و لەجێیدایکمانن، هەرگیز بەو قسانە نابنە دایکتان، واتە: تەنیا بە وتنی ڕستەی (وەك دایکم وایتە لە حەرامیدا) نابنە دایکتان، بەڵکو ئەوە هەر قسەیەکەو، خۆتان هەڵتان بەستووە، بەڵێ.. لەسەردەمی نەفامییدا هەر کەسێك بەژنەکەی خۆی گوتبا: تۆ وەك دایکم وایتە، بەوقسەیە لێی حەرام دەبوو! ئیسلام هات و ئەوەی هەڵوەشاندەوەو ئەحکامی بۆ ئەو وتەیە دانا، ئایەتی: (ماهن أمهاتهم إن



بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ ٱتَّقِ ٱللَّهَ وَلَا تُطِعِ ٱلْكَٰفِرِينَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ إِنَّ ٱللَّهَ
كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١﴾ وَٱتَّبِعْ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيْكَ مِن
رَّبِّكَ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴿٢﴾ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ
وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴿٣﴾ مَّا جَعَلَ ٱللَّهُ لِرَجُلٍ مِّن قَلْبَيْنِ فِى
جَوْفِهِۦ وَمَا جَعَلَ أَزْوَٰجَكُمُ ٱلَّٰٓـِٔى تُظَٰهِرُونَ مِنْهُنَّ أُمَّهَٰتِكُمْ
وَمَا جَعَلَ أَدْعِيَآءَكُمْ أَبْنَآءَكُمْ ذَٰلِكُمْ قَوْلُكُم بِأَفْوَٰهِكُمْ وَٱللَّهُ
يَقُولُ ٱلْحَقَّ وَهُوَ يَهْدِى ٱلسَّبِيلَ ﴿٤﴾ ٱدْعُوهُمْ لِءَابَآئِهِمْ
هُوَ أَقْسَطُ عِندَ ٱللَّهِ فَإِن لَّمْ تَعْلَمُوٓا۟ ءَابَآءَهُمْ فَإِخْوَٰنُكُمْ
فِى ٱلدِّينِ وَمَوَٰلِيكُمْ وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَآ أَخْطَأْتُم
بِهِۦ وَلَٰكِن مَّا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا
﴿٥﴾ ٱلنَّبِىُّ أَوْلَىٰ بِٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ وَأَزْوَٰجُهُۥٓ أُمَّهَٰتُهُمْ
وَأُو۟لُوا۟ ٱلْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ فِى كِتَٰبِ ٱللَّهِ
مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ إِلَّآ أَن تَفْعَلُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَوْلِيَآئِكُم
مَّعْرُوفًا كَانَ ذَٰلِكَ فِى ٱلْكِتَٰبِ مَسْطُورًا ﴿٦﴾



أمهاتهم إلا اللائى ولدنهم...)٢/٥٨پشتگیری هەرئەم ماناو مەبەستە دەکات، لەمە درێژ تریش ئەم باسی(ظیهار)ـە لەسوورەتی (موجادەلە)دا دێت. ﴿وماجعل أدعياءكم أبناءكم﴾ ئەوانەش کەئێوە داوای بەکوڕبوونیان دەکەن و، بەناوی ئێوەوە بانگ دەکرێن، خوا نەیکردوونەتە کوڕی ئێوەو,بەو قسەیە نابنە کوڕتان، بەڵکو هەر شتێکی سەرزارەکی و دەمییە. بەڵێ لەسەردەمی نەفامییدا کوڕی ئەم و ئەویان ئەهێنایە لای خۆیان و حوکمی کوڕی پشتی خۆیانیان دەدایە، تەنانەتی پەیامبەریش ﷺ پێش ئەوە ببێ بە پەیامبەر(زەیدی کوڕی حاریس)ـەی کردبووە کوڕی خۆی! ئەوسا قورئان هات و ئەو باوونەریتە جاهیلیەتەی هەڵوەشاندەوەو دووپاتیشی کردەوەوفەرمووی: ﴿ذلكم قولكم بأفواهكم﴾ ئەوەتان هەر وتەی سەرزارەکیی خۆتانەو هەقیقتی نیە، ئەگینا ئەوقسەیە بناغەو ناوەڕۆکێکی نییەو، هەرگیز کوڕی کەسیش نابێ بە کوڕی کەسێکی دیکە، کەسیش نابێ بەباوکی کەس بەقسەیەکی

سەرزارەکیی، وەك خوا لە سوورەتێکی تردا دەفەرموێ: (ماکان محمد ابا احد من رجالکم...)٣٣/٤٠. (عەبدوڵڵای کوڕی عومەر)دەڵێ: ئێمە (زەیدی کوڕی حاریس)ـمان هەر بە نێوی (زەیدی کوڕی موحەممەد)ەوە بانگدەکرد، هەتا ئایـەتی: (ادعـوهم لآبـائهم..) هاتـە خـواریٚ. (فتح البـاری:٨ /٣٧٧، موسـلیم:١٨٨٤/٤)﴿والله یقول الحق﴾ خـواش هەمیشە هەر وتەی ڕاست و دروست ئەڵێ وچی هەقە ئەوە بەیان دەکا ﴿وهو یهدی السبیل﴾ هەر ئەویشە بەندەکانی خۆی ڕێنوێن دەکابۆ ڕێی ڕاست،جا کەواتە تۆش ئەی موسڵمان! تـەنها گویٚ رایـەڵی ئەوبـە ﴿٥ ادعوهم لآبائهم هو اقسط عند الله﴾ هەر بەناوی باوکی خۆیانەوە بانگیان بکەن و نێویان بەرن، واتە: مەڵێن :(زەیدی کوڕی موحەممەد)، بەڵکو بڵێن: (زەیدی کوڕی حاریس)ـە، چونکە لای خوا هەر ئەوە پەسەند ودادگەرانەیە ﴿فإن لم تعلموا آباءهم﴾ خۆ ئەگەر باوکیشیانتان نەدەزانی هەتا بە ناوی باوکیانەوە بانگیان بکەن ﴿فإخوانکم فی الدین وموالیکم﴾ ئەوە برای ئایینی و دۆستانن، ئەگەر موسڵمان بن، وە خۆشەویست و مەولاتان، واتـە: پاش ئازادبوونی لـە کۆیلـەیی دەبـێ بڵێن: فلانەکەسی مـەولام!، بۆیـە بـۆ دوایـی پەیامبـەر ﷺ بە زەیـدی دەگـوت: تـۆ بـراو مـەولای ئێمـەی: (انت اخونا ومولانا) (فتح الباری:٧/٥٧٠). ﴿ولیس علیکم جناح فیما اخطأتم به﴾ خۆ ئەگەر بەهەڵە جارێکیش بانگتان لێ کردبن، زمانتان وا ڕاهاتبێ، ئەوە هیچ قـەیناکاو گوناهێکتـان ناگـات لـەو هەڵـەدا ﴿ولکن ما تعمدت قلوبکم﴾ بەڵکو گوناح لەوەدایە کە ئەگەر بەدڵەوەو بەدەست ئەنقەست ئەو کارەبکەن و نێویان بەرن بەغەیری باوکیان. ﴿وکان الله غفورا رحیما﴾ خواش هەمیشەگوناح پۆشە, دلۆڤان و میهرەبانە.

**پێغەمبەر بۆ موسڵمانان لەخۆیان فەرزترەو، هاوسەرەکانیشی دایکیانن:**

﴿٦ النبی اولی بالمؤمنین من انفسهم﴾ پەیامبەر ﷺ بە بڕواداران لە خودی خۆیانیش لە پێشترە، لە هەموو کارو بارێکی دین ودنیادا,وەهەرگیز پێیخۆش نەبووە موسڵمانان تووشی هیچ جۆرە بەڵاو نەهامەتێك ببن، هەموو کاتیش هەوڵیداوە بەرەو خێرو چاکە بچن وخۆی بەبرایان داناوە، دیارەکەدەبێ موسڵمانانیش هەرئەو بڕیار وحوکمیان بۆ بدا و، هەر قسەی ئەویش ببیسن، وەك خۆی لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێ: ((انا اولی بکل مؤمن من نفسه، فأیما رجل مات وترك دَیْنا فإلیّ، ومن ترك مالا فلورثته)).واتە: من بە خودی موسڵمانانەوە لە خۆیان بۆ خۆیان نزیکترم، جـا هەرکەسـێ بەقـەرزاری مـرد، قەرزەکـەی لەسـەر منـە و، مـن دەیبـژێرم، هەرکەسـێکیش مـردو مـاڵ وسـامانی لێبەجێما، ئەوەبۆمیراتبەرانی خۆی دەبێ. ئەم فەرموودەیە باشترین بەڵگەو نیشانەی دڵسۆزی ئەو پێغەمبەرە ﷺ نیشان دەدات بەرامبەر بە ئوممەتەکەی. پێشەوا (ئەحمەد)و (ئەبوو داود) ڕیوایەتیان کردووە. ﴿وأزواجه امهاتهم﴾ و ژنەکانیشـی دایکیـانن، پێویسـتە وەك دایکـی خۆیـان ڕێـز و حورمـەتیان لێبنـێن. واتـە: لـە ڕێزگـرتن و حـەرامیی مارەکردنیانـدا وەك دایکیـانن، بـەڵام لەتەماشـاکردن و خـەڵوەت و..هتددەبێ وەك ژنـانی ترمامەڵـەیان لـە گـەڵبکرێت ﴿وأولوا الأرحام بعضهم اولی ببعض فی کتاب الله من المؤمنین والمهاجرین﴾ و لەکتێبی خوادا(لوح المحفوظ), وا نووسراوە کە میراتی هێندێ لەهێنـدێ بەهۆی خزمایـەتی نەسـەبیی، لەخەڵکانـی تـری نێـو بڕواداران و کۆچکەران لەپێشترە،بەڵێ.. لە سەرەتای ئیسلامەوە بە هاوپەیمانی و بە موسڵمانەتی و برابوون بەدینی خوا، میراتیان لەیەکتر دەبرد، جا لەدواییدا لەناو موسڵماناندا ئەوحوکمەیە- وەکو(ئیبن عەباس) دەڵێ- هەڵوەشایەوەو چوویەوە سەرباری واقیعی خۆی. ﴿إلا ان تفعلوا إلی اولیائکم معروفا﴾ سامەگەر لەگەڵ خزم ودۆستاندا پیاوەتیی وچاکەیەك بکەن و شتێکیان بدەنێ ﴿کان ذلك فی الکتاب مسطورا﴾ میرات بردنی خزمان لە یەکترو میرات نەبردنی کافر لەموسڵمان، ئەمە لەقورئانی پیرۆزدا تۆمارەونووسراوەو دەبێ کاری پێبکرێ.

**خوا پەیمانی لە پێغەمبەران سەند:**

﴿[٧] وإذ اخذنا من النبيين ميثاقهم﴾ ئەو كاتە وەبیر بێنە كە ئێمە پەیمانمان لەپێغەمبەرانی پێشتۆ وەرگرت كە:هەڵسن بەئەركی سەرشانی خۆیان و بە باشی بەرنامەكەی خوا ڕابگەیەنن ﴿ومنك ومن نوح وإبراهيم وموسى وعيسى ابن مريم﴾ و بەتایبەتی لەتۆ -ئەی موحەممەد!ﷺ -و لە(نوح و ئیبراهیم و موساو عیسای كوڕی مەریەم-سلاّویان لە سەر بێت) ﴿وأخذنا منهم ميثاقا غليظا﴾ و بۆ ئەمەش پەیمانێكی بتەوو توندو مەحكەممان لێ وەرگرتن، دیارە پەیمانی پێغەمبەران لەپەیمانی خەڵكانیتر گرنگترە، هەر بۆیە لەم ئایەتانەشدا: (وإذ اخذ الله ميثاق النبيين لما آتيتكم من كتاب وحكمة ثم جاءكم رسول مصدق لما معكم لتؤمنن به ولتنصرنه..)٣/٨١، (شرع لكم من الدين ما وصى به نوحا والذى اوحينا إليك وما وصينا به إبراهيم وموسى وعيسى ان اقيموا الدين ولا تتفرقوا فيه..)٤٢/١٣) ئەو ماناومەبەستە دووپاتكراوەتەوە ﴿[٨] ليسأل الصادقين عن صدقهم﴾ تا خوا لەڕۆژی قیامەتدا لە ڕاستگۆیی ڕاستگۆیان (واتە:پێغەمبەران)بپرسێت: سەبارەت بەگەیاندنی پەیامەكەیان و وەڵامدانەوەی گەلەكەیان بۆیان، ئەوجاپاداشیان بداتەوە لەسەر ئیمان و بڕواكەیان ﴿وأعد للكافرين عذابا اليما﴾ و بۆ خوانەناس وبێ بڕوایانیش,سزایەكی بەئێشی ئامادەكردووە.



وَإِذْ أَخَذْنَا مِنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِيثَـٰقَهُمْ وَمِنكَ وَمِن نُّوحٍ وَإِبْرَٰهِيمَ
وَمُوسَىٰ وَعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ ۖ وَأَخَذْنَا مِنْهُم مِّيثَـٰقًا غَلِيظًا ﴿٧﴾
لِّيَسْـَٔلَ ٱلصَّـٰدِقِينَ عَن صِدْقِهِمْ ۚ وَأَعَدَّ لِلْكَـٰفِرِينَ عَذَابًا أَلِيمًا
﴿٨﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَآءَتْكُمْ
جُنُودٌ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا وَجُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ
بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا ﴿٩﴾ إِذْ جَآءُوكُم مِّن فَوْقِكُمْ وَمِنْ أَسْفَلَ
مِنكُمْ وَإِذْ زَاغَتِ ٱلْأَبْصَـٰرُ وَبَلَغَتِ ٱلْقُلُوبُ ٱلْحَنَاجِرَ
وَتَظُنُّونَ بِٱللَّهِ ٱلظُّنُونَا۠ ﴿١٠﴾ هُنَالِكَ ٱبْتُلِىَ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَزُلْزِلُوا۟
زِلْزَالًا شَدِيدًا ﴿١١﴾ وَإِذْ يَقُولُ ٱلْمُنَـٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم
مَّرَضٌ مَّا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ إِلَّا غُرُورًا ﴿١٢﴾ وَإِذْ قَالَت طَّآئِفَةٌ
مِّنْهُمْ يَـٰٓأَهْلَ يَثْرِبَ لَا مُقَامَ لَكُمْ فَٱرْجِعُوا۟ ۚ وَيَسْتَـْٔذِنُ فَرِيقٌ
مِّنْهُمُ ٱلنَّبِىَّ يَقُولُونَ إِنَّ بُيُوتَنَا عَوْرَةٌ وَمَا هِىَ بِعَوْرَةٍ ۖ إِن يُرِيدُونَ إِلَّا
فِرَارًا ﴿١٣﴾ وَلَوْ دُخِلَتْ عَلَيْهِم مِّنْ أَقْطَارِهَا ثُمَّ سُئِلُوا۟ ٱلْفِتْنَةَ
لَـَٔاتَوْهَا وَمَا تَلَبَّثُوا۟ بِهَآ إِلَّا يَسِيرًا ﴿١٤﴾ وَلَقَدْ كَانُوا۟ عَـٰهَدُوا۟
ٱللَّهَ مِن قَبْلُ لَا يُوَلُّونَ ٱلْأَدْبَـٰرَ ۚ وَكَانَ عَهْدُ ٱللَّهِ مَسْـُٔولًا ﴿١٥﴾



**جەنگەكەی خەندەق:**

ئینجا دەچێتە سەر باسی جەنگی چاڵ (خندق - ئەحزاب) و دەفەرموی: ﴿[٩] يا أيها الذين آمنوا اذكروا نعمة الله عليكم﴾ ئەی گەلی خاوەن باوەڕ! بەردەوام یادی نیعمەت و بەخششی خوا بكەنەوە بەسەرتانەوە ﴿إذ جاءتكم جنود﴾ ئەودەمە كە لەشكرێكی فرەگەورە هاتە سەرتان، واتە: لەڕۆژی (خەندەق)دا، كە لەناو تیرەكانی عەرەب وجوولەكەدا(١٢) هەزار جەنگاوەر ئامادە كرابوو، جاكاتێ ئەو دەنگ وباسە گەیشتە پەیامبەر ﷺ, ئەویش خێرا مەشوەرەتی لەگەڵ هاوەڵانكرد چی بكەن باشە! جا لەسەر ڕاو بۆ چوونی (سەلمان)ی فارسیی -كەشارەزایی لەنەخشەو پلانی فارسەكان هە بوو- سەربازگەیەكیان دروستكردوچاڵێكیان لەنێوانیاندا لێدا، ئەوجار (سێ هەزار) سەربازی موسڵمان كۆبوویەوەو ڕووبەڕووی ئەو لەشكرە دوازدە هەزار كەسیە وەستان و، موسڵمانەكان ترسی تێكشانیان لێنیشت و، هەزارو یەك حیسابیان بۆ ئەنجامی خۆیان و جەنگەكە دەكرد ﴿فأرسلنا عليهم ريحا وجنودا لم تروها﴾ ئەوسا ئێمەیش لەوكاتە زۆر ترسناكەدا (با)یەكی زۆر توندو ساردمان نارده سەریان، هاوڕێ لەگەڵ كۆمەڵێ سەربازی فریشتەدا كە ئێوە نەتاندیتن، دەرەنجام هەرچی چادرو مەنجەڵ و دیزە وكۆزەیان بوو تێك وپێك شكاو سەروخوار بوویەوەوخۆیشیان بەپەلە هەڵهاتن، ئەمەیە كە پێغەمبەر-ص- دەفەرموێ ((نُصِرتُ بالصَّبا، واهلكت عاد بالدَّبور)) فتح البارى/٦٠٤ ﴿وكان الله

بما تعملون بصيرا ﴾ وه خوا هەموو كات بينايە بەو كاروكردەوەيە, ئێوە ئەنجامی ئەدەن،وەكو خەندەق لێدان وددان بەخۆدا گرتن و..هتد ﴿[١٠] إذ جاؤكم من فوقكم ومن اسفل منكم ﴾ كەدوژمن لەلای سەروو، لەلای خواروتانەوە بۆتان هاتن، واتە: لە خۆرهەلات وخۆرئاوای شاری (مەدينە)وە هێرشيان هێنايە سەرتان وئابلۆقە دران ﴿و إذ زاغت الابصار ﴾ وئيتر گش چاوێ كلاومۆلەق بوو و، لە روانينی‌باری ئاسايی خۆی ﴿وبلغت القلوب الحناجر ﴾ وهەموودڵێكيش لەترسدا گەيشتە گەروو، هاوەڵان بەپێغەمبەريان گوت: دۆعايەك هەيە بۆ ئەم سات وكاتە بيلێين؟ فەرمووی: بڵێن: ((اللهم استر عوراتنا، وآمن روعاتنا)).﴿وتظنون بالله الظنونا ﴾ و ئێوەش گومانێ زۆری جۆراو جۆرتان بە خوا دەبرد!

## ئەزموونكردنی برواداران و هەڵوێستی دووڕووەكان:

﴿[١١] هنالك ابتلى المؤمنون ﴾ لەو جێگاو شوێنەدا بڕوادارەكان كەوتنە ژێر تاقييكردنەوە،واتە: ئەو كارەيە تاقييكردنەوەبوويان، بۆ ئەوەی مرۆڤی دڵسۆزو ڕاستگۆو، مرۆی دووڕووناڵەبار لەيەك جيابينەوە ﴿وزلزلوا زلزالا شديدا ﴾ وه تەكانێكی زۆر سەختيان خواردو كەوتنە چرکە چرك و، زۆر بە توندی حاڵيان تێكچوو وكەوتنە وەزعێكی ناهەموارەوە، واتە:دەتگوت زەوی لەژێرپێيانەوەدەلەرزێ ودەتەقێتەوە ﴿[١٢] وإذ يقول المنافقون والذين في قلوبهم مرض ﴾ بير بێنە ئەوكاتەی دووڕووەكان وئەوانەش دڵيان نەخۆش بووئەيانوت:﴿ماوعدنا الله ورسوله إلا غرورا ﴾ ئەو بەڵێنەی خواو پێغەمبەرەكەی پێياندابن بە سەركەوتن،هەر فريودان ولەخشتەبردن بوو بۆمان! واتە: بەڵێنی بە سەركەوتنی بەسەر (فارس وڕۆم)دا پێدابن، كەچی وائێستا كەسێك ناتوانێ بەئاسانی سەرئاوێكيش بكات. أسباب النزول/ للسيوطي. ﴿[١٣] وإذ قالت طائفة منهم ﴾ ئەو كاتەش وەبيربێنە كە دەستەيەك لەدووڕازەكان وتيان:﴿يا اهل يثرب لا مقام لكم ﴾ ئەی خەڵكی مەدينە! ئەمە جێ وشوێنی مانەوەنيە بۆ ئێوە، ئەر هەر لێرەبمێننەوە، لەوانەيە هەموو تيابچن ﴿فارجعوا ﴾ دەسا هەتا نەكوژراون بگەڕێنەوە بۆ ناوشارو،دەست لە (موحەممەد)و هاوەڵانی هەڵگرن. (ئيبن عەبباس)ئەڵێ: جوولەكەكان بە (عبدوڵلای كوڕی ئوبەی)يان گوت: لەبەرچی خۆتان بەدەستی (ئەبوو سوفيان)و هاوڕێيانی ئەو بەكوشت ئەدەن! دەبگەڕێنەوە بۆمەدينە، ئێمەيش لەوێن چاوەڕوانتان ئەبين، ئەوسائەم ئايەتی:(وإذ قالت طائفة منهم..) هاتە خوارێ. ﴿ويستأذن فريق منهم النبى ﴾ دەستەيەكيشيان (هۆزی بەنی حاريسە) بۆ خۆدزينەوەدەهاتن مۆڵەتيان لەپەيامبەرﷺ دەخواست ﴿يقولون إن بيوتنا عورة ﴾ ودەيانوت: ماڵەكانمان بێپارێزەرەو كەسمان دانەناوە ئاگای لێيان بێ،جا لەبەر ئەوە هەر دەبێ بگەڕێينەوە پاسەوانييان بكەين! ﴿وماهى بعورة ﴾ خۆلەڕاستيشدا درۆيان كردو بێپارێزگار نەبوون، بەڵكو لەجێگەی مەحكەمدا بوون ﴿إن يريدون إلا فرارا ﴾ هەر ئەيانەوێ لەگۆڕەپانی جيهاد هەڵبێن وخۆ بدزنەوەو ڕابكەن ﴿[١٤] ولو دخلت عليهم من اقطارها ﴾ ئەوەندەيش ترسنۆكن،ئەر لەشكری دوژمن لەم لاولەولای مەدينەوە هاتبايەتە سەريان ﴿ثم سئلوا الفتنة لأتوها وما تلبثوا بها إلا يسيرا ﴾ پاشان داوای هەڵگەڕانەوەيان لەدين لێكردبان ,وەڵاميان دەدانەوەو, كەمێك نەبا پێوەی نەدەمانەوە ﴿[١٥] ولقد كانوا عاهدوا الله من قبل لايولن الأدبار ﴾ خۆ زووتريش –پێش ڕووداني‌جەنگی خەندەق ودوای جەنگی بەدر– پەيمانيان بەخوا دابوو كە هەرگيز لەگۆڕەپاندا پشت لەدوژمن هەڵنەكەن ونەبەزێن كەچی‌درۆيان كرد ﴿وكان عهد الله مسؤلا ﴾ ديارە پەيمان بەستن لەگەڵ خوادا، لێپرسينەوەی هەيەوڵێی‌بەرپرس دەبن ﴿[١٦] قل لن ينفعكم الفرار إن فررتم من الموت أو القتل ﴾ پێيان بڵێ: ئەی موحەممەدﷺ ئەر ئێوە بتانەوێ لەمردن، يان لەكوشتن هەڵبێن و ڕابكەن، هەڵهاتن سوودتان پێنابەخشێ ﴿وإذا لاتمتعون إلا قليلا ﴾

ئەگەر سوودیشتان پێ ببەخشێ, هەرکەمێك دەژین وڕادەبوێرن، ئیتر سەرەنجامتان هەر مردنەو دەگەڕێنەوە لای خۆمان ﴿ [١٧] قل من ذا الذی یعصمکم من الله﴾ پێیان بڵێ:باشە! ئەوە کێیە دەتوانێ پەناتان بدا لەخواو،لەبەرامبەر ئیرادەی خۆیەوە بتانپارێزێ؟ ﴿إن اراد بکم سوءا او ارادبکم رحمة﴾ ئەرویستی ناخۆشیەکتان تووش بکات، یان ویستی خێرو چاکەیەکی بوو پێتان ﴿ولا یجدون لهم من دون الله ولیا ولا نصیرا﴾ ئاشکرایشە بێجگە لە خوا، ئەودووڕووانە هیچ دۆست ویارمەتیدەرێکیان دەستناکەوێ،کە بتوانێ نەهێڵێ ﴿ [١٨] قد یعلم الله المعوقین منکم﴾ بێگومان خوا بەچاکی ئەوکەسانەتان دەناسێت کە کۆسپ وتەگەرە دەخەنە بەردەم جیهادی موجاهیدان ﴿والقائلین لأخوانهم هلم إلینا﴾ و ئەوانەش کەبەبراکانی خۆیان دەڵێن: وەرنە لای ئێمە و واز لە موحەممەد وهاوەڵانی بێنن و،خۆمەدەنە کوشت ﴿ولا یأتون البأس إلا قلیلا﴾ نایەنە جەنگەوەکەمێك نەبێ ﴿ [١٩] اشحة علیکم﴾ بەرامبەر بەئێوەش زۆر ڕژدوبێ هیممەت وپیسکەن و،قەتیش حەز بەسەرکەوتنتان ناکەن ﴿فإذا جاء الخوف رایتهم ینظرون إلیك﴾ جاکەترس وبیمیش پێش هات وجەنگ دەستی پێکرد، دەیانبینی بەجۆرێ تەماشات دەکەن ﴿تدور اعینهم﴾ چاوەکانیان لەکالاندا دەسوڕێتەوەو سپی هەڵدەگەڕێت ﴿کالذی یغشی علیه من الموت﴾ وەك کەسێ: لەترسی مردن بێهۆش بووبێ، واتە: ئەوکەسەی کە لەحاڵی خۆیدا بێت چۆن چاوەکانی سپی وەردەگەڕێ وئەبڵەق دەبێ، ئەوانەش لەترساوایان لێدێت ﴿فإذا ذهب الخوف سلقوکم بألسنة حداد﴾ جا هەرکەترسەکە چوو ونەما، لێتان دەدەن بەزمانە تیژەکەیان و،داوای بەشە غەنیمەتیخۆیانت لێدەکەن! ﴿اشحة علی الخیر﴾ لەگەڵ ئەوەشدا کەبەتەمای غەنیمەت وتاڵانەکەن،لەبەرڕژدیی و چروکی و چکووسییان، هەرگیز لەدەسیان خێر ناکەوێتەوە ﴿اولئك لم یؤمنوا﴾ ئائەوانە هەرلە بنەڕەتدا بڕوایان نەهێناوە، بۆیە ئێستا ئەوەحاڵیانە ﴿فأحبط الله أعمالهم﴾ ئینجا لەبەرئەوە خواش کارەکانیانی پووچەڵ کردوٚتەوە ﴿وکان ذلك علی الله یسیرا﴾ دیارە ئەوەش بۆ خوا کارێکی ئاسانە ﴿ [٢٠] یحسبون الأحزاب لم یذهبوا﴾ ئەو حیزب وگرووپانە — ئەوەندە ترسنۆکن — وا دەزانن کە هێشتا سوپای گروپەکان لەدەوروبەری مەدینەدا ماوەو نەڕۆیشتوون، خۆ ڕۆیشتبوون و گەڕابوونەوە ﴿وإن یأت الأحزاب یودوا لو انهم بادون فی الاعراب﴾ خۆئەر بۆجارێکی تر لەشکری ئەوگرووپانە بێنەوەسەریان ئاوات دەخوازن کە لەناو عەرەبە دەشتەکییەکاندا بووبان و نەهاتنایە جەنگەکەوە، هە تا تووشی ئەو ئازارو ترسە نەبوونایە ﴿یسألون عن انبائکم﴾ و هەر لەوێیشەوە لە دەنگ وباسی ئێوەیان پرسیبا ﴿ولو کانوا فیکم ما قاتلوا إلا قلیلا﴾ خۆ ئەگەر لەناو ئێوەشدا بوونایە -کاتێ کە جەنگ هەڵدەگیرسا- کەمێك نەبا جەنگیان نەدەکرد، چونکە ترسنۆك وگیان خۆشە ویستن.

الجزء الحادي والعشرون سورة الأحزاب

قُلْ لَنْ يَنفَعَكُمُ ٱلْفِرَارُ إِن فَرَرْتُم مِّنَ ٱلْمَوْتِ أَوِ ٱلْقَتْلِ وَإِذًا
لَّا تُمَتَّعُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٦﴾ قُلْ مَن ذَا ٱلَّذِى يَعْصِمُكُم مِّنَ ٱللَّهِ إِنْ
أَرَادَ بِكُمْ سُوٓءًا أَوْ أَرَادَ بِكُمْ رَحْمَةً ۚ وَلَا يَجِدُونَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ
وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿١٧﴾ ۞ قَدْ يَعْلَمُ ٱللَّهُ ٱلْمُعَوِّقِينَ مِنكُمْ وَٱلْقَآئِلِينَ
لِإِخْوَٰنِهِمْ هَلُمَّ إِلَيْنَا ۖ وَلَا يَأْتُونَ ٱلْبَأْسَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٨﴾ أَشِحَّةً
عَلَيْكُمْ ۖ فَإِذَا جَآءَ ٱلْخَوْفُ رَأَيْتَهُمْ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ تَدُورُ أَعْيُنُهُمْ
كَٱلَّذِى يُغْشَىٰ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْمَوْتِ ۖ فَإِذَا ذَهَبَ ٱلْخَوْفُ سَلَقُوكُم
بِأَلْسِنَةٍ حِدَادٍ أَشِحَّةً عَلَى ٱلْخَيْرِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ لَمْ يُؤْمِنُوا۟ فَأَحْبَطَ
ٱللَّهُ أَعْمَٰلَهُمْ ۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ﴿١٩﴾ يَحْسَبُونَ ٱلْأَحْزَابَ
لَمْ يَذْهَبُوا۟ ۖ وَإِن يَأْتِ ٱلْأَحْزَابُ يَوَدُّوا۟ لَوْ أَنَّهُم بَادُونَ
فِى ٱلْأَعْرَابِ يَسْـَٔلُونَ عَنْ أَنۢبَآئِكُمْ ۖ وَلَوْ كَانُوا۟ فِيكُم
مَّا قَٰتَلُوٓا۟ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٢٠﴾ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِى رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ
حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْءَاخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾
وَلَمَّا رَءَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْأَحْزَابَ قَالُوا۟ هَٰذَا مَا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ
وَصَدَقَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ ۚ وَمَا زَادَهُمْ إِلَّآ إِيمَٰنًا وَتَسْلِيمًا ﴿٢٢﴾

٤٢٠ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ

## پێغەمبەری خوا سەرمەشقە بۆ موسڵمانان:

﴿[٢١] لقد كان لكم في رسول الله اسوة حسنة﴾ بەڕاستیی پەیامبەری خوا چاکترین نموونەی ڕێك وپێکی و سەرمەشقە بۆتان، دەسا ئێوەش لەدڵسۆزیی وسیاسەتی و جیهادیی و ئارامیی وتەقوایی و تەواوی بوارەکانی ژیاندا چاوی لێبکەن و بەدوایدا بچن ﴿لمن كان يرجوا الله واليوم الآخر﴾ بەتایبەتی بۆ ئەوکەسە, کە بە تەمای خواو ڕۆژی دواییە ﴿وذكر الله كثيرا﴾ یادی خواش زۆر دەکا. ئینجا هەڵوێستی موسڵمانەکان لەجەنگی گرووپەکاندا ڕووندەکاتەوەودەفەرموێ: ﴿[٢٢] ولما رای المؤمنون الأحزاب﴾ جاکە بڕواداران ئەوهەموو لەشکرو دەسەڵاتەی حیزبەکانیان چاوکرد کە بەرەو ڕوویان دەهاتن بۆمەدینە ﴿قالوا هذا ماوعدنا الله ورسوله﴾ گوتیان: ئەمە هەرئەو بەڵێنە بوو کە خواو پەیامبەرەکەی پێیاندابن،واتە: لەپێشەوە بەڵێنیان پێدابن بە ڕۆژە دژوارو سەختەکان, لە پاشان بە یاریدەدان و سەرکەوتن ﴿وصدق الله ورسوله﴾ خواو پەیامبەرەکەی ڕاستیان فەرمووە. (ئیبن عەباس)دەڵێ: مەبەست بەو ئایەتەش کە لەسوورەتی (بەقەرە)دایەو دەفەرموێ: (..مستهم البأساء والضراء وزلزلوا حتى يقول الرسول والذين آمنوا معه متى نصر الله ألا إن نصر الله قريب).هەربۆ هەمان ماناومەبەستە ﴿وما زادهم إلا إيمانا وتسليما﴾ ئەورووداوە کەبەوجۆرە پێش هات، باوەڕدارەکان پتر باوەڕوملکەچییان زیادی کرد، جەماوەری زاناکان ئەم ئایەتە-وەکو ئایەتەکانی تری لەوچەشنە- دەکەنە بەڵگەی زیاد بوونی ئیمان باوەڕ. ئەوە هەڵوێستی دووڕازەکان بوو، ئینجا بۆ دیاریکردنی هەڵویستی ئیماندارەکان دەفەرموێ: ﴿[٢٣] من المؤمنين رجال صدقوا ماعاهدوا الله عليه﴾ لەناو ئەوبڕوادارانەشدا پیاوانی وایان هەبوو،ئەوپەیمانەی بەخوایانـدابوو، ڕاستیان لەگەڵکردو،زۆر بەباشی پابەندیشبوون پێیەوە و، کاتێکیش کەوتنە جەنگەوە مەردانە جەنگیان کرد ﴿فمنهم من قضى نحبه﴾ ئینجابووشیان نەزرو پەیمانی خۆی بردە سەرو،جەنگاوەرانە جەنگی کرد تاشەهیدکرا ﴿ومنهم من ينتظر﴾ هەشیان بوو هەردەم چاوەڕوانیشەهیدیبوولەڕێی خوادا ﴿وما بدلوا تبديلا﴾ بەهیچ جۆرێکیش کلا نەبوون و پەیمانی خۆیان نەگۆڕی.(ئەنەس) دەڵێ:مامم لەبەر ئەوە کەلە(بەدر)دا ئامادە نەببوو،خۆی زۆر بەزیانمەنددادەناو، بڕیاریدا بەخواکە لە جەنگی ئایندەدا جێدەسی دیار بێت بۆئیسلام و، قارەمانیەتی خۆی بنوێنێ، جا کەجەنگی خەندەق پێش هات، بێ دووو سێ چوویە جەنگەکەوەو، قارەمانانە جیهادی خۆیکردو،پاشان شەهیدبوو، ئەنەس دەڵێ:کە تەماشامانمان کرد، دەبینین(٨٣) برینی پێوەیەو وای لێکرابوو، پوورم گوتی: بە نیشانەیسەر پەنجەکانیا ناسیمەوە، ئەوجا ئەم ئایەتەی:(من المؤمنين رجال صدقوا ماعاهدواالله عليه..) بۆ قەدردانیئەوکارەی مامم هاتە خواری ﴿[٢٤] ليجزى الله الصادقين بصدقهم﴾ بۆ ئەوە

الجزء الحادي والعشرون — سُورَةُ الأَحْزَابِ

مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا۟ مَا عَٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ عَلَيْهِ ۖ فَمِنْهُم مَّن
قَضَىٰ نَحْبَهُۥ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ ۖ وَمَا بَدَّلُوا۟ تَبْدِيلًا ﴿٢٣﴾ لِّيَجْزِىَ
ٱللَّهُ ٱلصَّٰدِقِينَ بِصِدْقِهِمْ وَيُعَذِّبَ ٱلْمُنَٰفِقِينَ إِن شَآءَ
أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٢٤﴾ وَرَدَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ
كَفَرُوا۟ بِغَيْظِهِمْ لَمْ يَنَالُوا۟ خَيْرًا ۚ وَكَفَى ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلْقِتَالَ ۚ
وَكَانَ ٱللَّهُ قَوِيًّا عَزِيزًا ﴿٢٥﴾ وَأَنزَلَ ٱلَّذِينَ ظَٰهَرُوهُم مِّنْ
أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ مِن صَيَاصِيهِمْ وَقَذَفَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعْبَ
فَرِيقًا تَقْتُلُونَ وَتَأْسِرُونَ فَرِيقًا ﴿٢٦﴾ وَأَوْرَثَكُمْ أَرْضَهُمْ
وَدِيَٰرَهُمْ وَأَمْوَٰلَهُمْ وَأَرْضًا لَّمْ تَطَـُٔوهَا ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ
شَىْءٍ قَدِيرًا ﴿٢٧﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ
ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ
سَرَاحًا جَمِيلًا ﴿٢٨﴾ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ
ٱلْءَاخِرَةَ فَإِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَٰتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٢٩﴾
يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِىِّ مَن يَأْتِ مِنكُنَّ بِفَٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ يُضَٰعَفْ
لَهَا ٱلْعَذَابُ ضِعْفَيْنِ ۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ﴿٣٠﴾

٤٢١

لەئەنجامدا خوا پاداشی ڕاستگۆیان بداتەوەبەهۆی ڕاستگۆییان ﴿ويعذب المنافقين إن شاء او يتوب عليهم﴾ ئەرحەزیش بکا ئازاری دووڕووەکان بدا، وەیان تەوبەیان لێ وەرگرێ، گەر پەشیمان بوونەوە ﴿إن الله كان غفورا رحيما﴾ چوون بە ڕاستیی خوا هەمووکات لێبوردەیە، زۆریش بەبەزەیی و دلۆڤانە، بۆیە دەرگای والآیە بۆ هەمووکسێك بێت تەوبە بکات.

## خوا دوژمنانی تێکشکاند:

﴿[٢٥] ورد الله الذين كفروا بغيظهم﴾ بێ بڕواکانیش- کە هاتبوونە دەوروبەری مەدینە بۆ سەرکوتکردنی موسڵمانەکان- خوا دای بەپۆزەیانداو بەدڵی پڕ لەڕق وقینەوە گێڕانیەوە ﴿لم ينالوا خيرا﴾ وهیچ بەهرە یەکیشیان دەست نەکەوت ﴿وكفى الله المؤمنين القتال﴾ وێڕای ئەوەش لەگۆڕەپانی جەنگدا، خوا موسڵمانەکانی پاراست و بێ نیازی کردن لە جەنگی شەڕفرۆشان، ئەوەبوو باو گەردەلوولێکی ناردە سەریان و، فریشتەش هاتە گۆڕەپانەوەپشتگیری لێکردن وئەوان تێکشکان ﴿وكان الله قويا عزيزا﴾ دیارە کەخوا هەمیشە بەهێزە بۆ تۆڵە وەرگرتن لەدوژمن، زۆریش زاڵ و بەدەسەڵاتە" بۆیە پەیامبەرﷺ فەرمووی: ((لا إله إلا الله وحده، ونصر عبده،وأعزجنده، وهزم الأحزاب وحده فلاشئ بعده)) بوخاریی وموسلیم.، وە فەرمووێ: ((اللهم مُنْزِلَ الكتاب، سريعَ الحساب، إهزم الأحزابَ، اللهم اهزِمْهم وزَلْزِلْهُمْ))متفق عليه.

**بەڵێ جەنگی ئەحزاب:** ساڵی پێنجەمی کۆچی ڕوویدا، هۆکەیشی ئەوەبوو کە جوولەکەکانی (بەنی نەزیر)چوونە مەککەو لەگەڵ قوڕەیشدا وتوێژیان کردو هەڵیاننان بۆ بەگژا چوونی پەیامبەرﷺ وە ئامادەیی وپشتگیری خۆشیانیان بۆ دەربڕین ودەست خەڕۆیان کردن کە تا ئاخر دڵۆپی خوێن لەگەڵیانبن، پاش ئەوانیش سەردانی هۆزی (غەتەفان)یان کرد بۆ هەمان مەبەست، ئەوانیش لەگەڵ هاوپەیمانەکانیان، وەك (بەنی ئەسەد)و (بەنی سولەیم) ڕێککەوتن بۆ ئەوەی بەیەك دەست لەموسڵمانەکان بدەن و،ئیتر هەتا هەتایە زیندوو نەبنەوە!! پەیامبەری خوایش ﷺ ئەنجوومەنی ڕاوێژی ئەودەمەیکۆکردەوە بۆ مەشوەرەت، بەڵام پێش ئەوە لەسەر پێشنیازی سەلمانی فارسیی خەندەقێکی قووڵ بەدەوری مەدینەدا لێدرا، بۆیە ئەو جەنگەش ناوبانگی بەجەنگی خەندەق (چاڵ)دەرکرد. بەڕاستیی ئەو ڕۆژە بۆ بڕواداران ڕۆژێکی زۆر سەخت بوو، چونکە لەلایەکەوە (دوازدە هەزار) جەنگاوەر بەئەوپەڕی دەسەڵاتی جەنگییەوە هاتبوونە سەریان، موسڵمانەکانیش تەنها (سێ هەزارکەس) بوون لەگەڵ کەمیی ژمارەیان وخراپیی هۆیەکانی جەنگییان، ئیتر دووڕووەکانی ناو شاری مەدینەش بابوەستێ چ هەراو ڕروپاڵانتەیەکیان نایەوە،بەڵام خوای گەورە – وەك لەئایەتی(٢٥)ی ئەم سوورەتەدا ڕایئەگەیەنی- پۆرتی شکاندن وبەسەرشۆڕی گەڕانەوە، جا لەم داستانەشدا ئەم پەندو وانانە وەردەگیردرێن:

**یەکەم:** بێ ئاکامکردنەوەی تەواوی هەوڵەکانی دوژمن وتێکشکانی گەورەترین سوپاو هێزیان.

**دووەم:** دەرکەوتنی دووڕووەکان و گزی وخیانەتیان لەناو خۆدا.

**سێ یەم:** قەرەبووکردنەوەی تێکشکانەکەی ئوحود.

**چوارەم:** پڕکردنی دڵی دوژمن لەترس وبیم.

**پێنجەم:** بەرزبوونەوەی ورەی موسڵمانان و گەشە کردنی باوەڕیان بەو ڕووداوەی گۆرەپانە.

**شەشەم:** سەقامگیر بوونی دەسەڵاتی پەیامبەرﷺ لەدەرەوەو ناوەوەی مەدینە.

**حەوتـــەم**: زەمینەسازبوو بۆ پاکسازی مەدینـە لەخراپـەکاری جوولەکـەی(بـەنی نـەزیر)و، جولەکـەی (بـەنی قـورەیزە).چـوونکە لەمەدینــەدا ســێ دەســتەجوولەکە هــەبوون: (بــەنی قــورەیزە، بــەنی نــەزیر، بــەنی قەینوقاع)هەرسێکەشیان کاتی خۆی پەیمانیان بە پەیامبەرﷺ دابوو: کەلەگەڵ دوژمنی ئەودا هاوکاری وسیخوڕی نەکەن، بەڵام (بـەنی قـەینوقاع)لـە ساڵی دووەمـی کۆچیو، (بـەنی نـەزیر)لەساڵی چوارەمی کۆچیدا، هەریەکـەیان بەبیانوویـەك پـەیمانی خـۆی هەڵوەشـاندەوەو دەرەنجـام دەسـتیان کـردە ڕووبـەڕوو بوونـەوە, ئینجا پێغەمبـەرﷺ بۆیەکلاکردنەوەیجەنگەکە,- بەفەرمانی خوا- هاوەڵانی کۆکردەوە و فەرمووی: دەبێ هـەر ئەمرۆ پێش نوێژی عەسر بەرەو (بەنی قورەیزە)بکەونە ڕێ و هەر لەوێش نوێژەکەتان بکەن, ئەم فەرموودەی ((لا يُصَلِّيَنَّ أحد منكم العصرَ إلا في بني قريظة)) ئەو ماناو مەبەستە دەبەخشێ، ئەوجا موسڵمانەکانیش بەپەلەئامادە بوون و پێش خۆرئاوا بوون، قەڵا مەحکەمەکانیان لێگەماڕۆدان، ئەوجا پاش(٢٥)ڕۆژ گـەمارۆ هـەموو خۆیـان بەدەستەوەداو تەسلیم بـوون، دیارە هەرلەوپاکسازییەشدا دەستەیەکیان کوژران و، دەستەیەکیان دیل کران.(فقطع دابر القوم الذين ظلموا والحمد لله رب العالمين).

### جەنگی جوولەکەی بەنی قورەیزە:

﴿[٢٦] وانزل الذين ظاهروهم من أهل الكتاب من صياصيهم﴾ هـەر ئـەو خوایـە کـە تـوانی دووڕووەکـان ئـاوا ئێیکات..توانی خاوەن نامەکانیش -کە پشتوانییان لەوانە دەکرد- لەقەڵاوبارەگاکانیان دابەزێنێتە خوارێ، واتە: جوولەکەکانی (بەنی قورەیزە) -کە لـەناو مەدینـەدا یارمـەتی دووڕووەکانیان دەدا-تێکشکان ﴿وقذف في قلوبهم الرعب﴾ و ترسێکی زۆریشی خستە دڵیانەوە ﴿فريقا تقتلون وتأسرون فريقا﴾ دەرەنجام ئێوە ئەی موسڵمانان! دەستەیەکتان لێدەکوشتن،واتە: پیاوەکانیان، دەستەیەکیشتان لـێ دیل دەکردن،واتـە: ژن و منداڵـەکانیان. ئەمانـە جوولەکەکانی بەنی قورەیزە بوون کە لەگەڵ پەیامبـەرداﷺ پەیمانیان هـەبوو، بـەڵام پەیمانەکـەیان هەڵوەشاندەوەو چوونە ناو بەرەی قورەیشەوە، جا کاتێ موشریکەکان تێکشکان و مەدینـەیان جێهێشت، پەیامبـەرﷺ گەمارۆیدان و سەرەنجام ئاوابوونە پەندو عیبرەت بۆ دوای خۆیـان ﴿[٢٧] واورثكم ارضهم وديارهم وأموالهم﴾ هەرچی زەویـی وزارو ماڵ وسامانێکیان هـەبوو خـوا دای بـەئێوە ﴿وارضا لم تطؤها﴾ وە ئـەو زەوییـەش کـە هێشـتا پێتـان تێنـەنابوو و پێیـنەگەیشتبوون، واتە: (خەیبەر)و هەر ناوچەو وڵاتێکی تر کە: لە ئایندەدا خوا بڕیاری لەسەرداوەبکەوێتە دەستی موسڵمانان ﴿وكان الله على كل شئ قديرا﴾ هەمیشە خوا بەسەر هـەموو شتێکدا دەسەڵاتدارو بەتوانایەو، بەرەوانی لەموسڵمانان دەکاو، پۆزەی پۆزەداران دەشکێنێ.

### ژنەکانی پێغەمبەر, خواو پێغەمبەریان هەڵبژارد:

دوای تێکشکانی گرووپەکان و دەستکەوتی جەنگی (بەنی قورەیزە), ژنەکانی پەیامبەرﷺ پێیان وابوو کەهەقە ژیان وژیواری ئەمانیش خۆش ببێ.. بۆیـە داوایان لە پەیامبـەرکرد کە بەڵکو کەمـە کەمـە ژیانیان خۆشترکا ,بۆیە وتیان:ئەوەتـە ژنان و کچانی(کیسرا)و(قەیسـەر)بـەو شێوەیە ڕائـەبوێرن کە رادەبوێرن!، ئێمـەش ئالـەم ژیانـە تـاڵ وتفتەدا دەژین!! هەقە تۆش وەك ئەوانەمان لەگەڵ بکەیت! ئەوسا خوایش بۆ راستکردنەوەی ئەوبۆچوونە یان ,ئەم ئایەتەی ناردو فەرمووی: ﴿[٢٨] يا ايهاالنبي قل لأزواجك﴾ ئەی پەیامبـەر!ﷺ بەژنـەکانت بڵـێ: ﴿إن كنتن تردن الحياة الدنيا وزينتها﴾ ئـەر ئێـوە ژیـن و جـوانی ئـەم دنیایـەتان دەوێ ﴿فتعالين امتعكن﴾ دەسا وەرنـە پێش,با مـارەیی وهەنـدێ شـتومەکتان بـدەمێ ﴿واسرحكن سراحا جميلا﴾ وبـەخوا پەسـەندانەو جـوانی دەسـتتان لێبەربـدەم و

بەڕێتانکەم، واتە: بێ هیچ ڕەنجە دڵ و گازندەو دەردی سەرییەك ﴿[٢٩] وإن كنتن تردن الله ورسوله والدار الآخرة﴾ وەئەگەر خواو پەیامبەرەکەیو، پاداشی دواڕۆژتان دەوێ و، ڕازی دەبن بەو ژیانەی ئێستاتان ﴿فإن الله اعد للمحسنات منكن أجر عظيما﴾ ئەوەبەڕاستی خوا بۆ چاکەکارانتان -ئەوانەتان ڕازی ئەبن بەم ژیانە- پاداشتێکی گەورەی ئامادە کردووە. ﴿[٣٠] يا نساء النبى من يأت منكن بفاحشة مبينة﴾ ئەی ژنانی پەیامبەر!ﷺ هەرکامێکتان کارێکی دزێوی ئاشکرای لێ ڕووبدا، واتە: کارێکی وابێت دڵی پەیامبەرﷺ زویربکات وبێ فەرمانی ئەو بێت وەك (ئیبن عەبباس)دەڵێ. ﴿يضاعف لها العذاب ضعفين﴾ باچاك بزانێت دوو بەرابەر سزاو جەزرەبە دەدرێ، زیاد لەژنانی خەڵکی، چونکە ئێوە خاوەنی ئەو پلەبەرزەن و، ژنی پەیامبەرن، دیارە تاوانیشتان دووبەرامبەرە ﴿وكان ذلك على الله يسيرا﴾ ئەوەیش بۆ خوا ئاسانە.

## کۆتایی جزمی بیست و یەکەم
و لله الحمد والمنة.

*** *** ***

﴿[٣١] ومن يقنت منكن لله ورسوله وتعمل صالحا﴾ هەرکامێکیشتان بەرفەرمان و ملکەچی بۆخواو پەیامبەرەکەی بکاو،کاروکردەوەی چاکیش ئەنجام بدا ﴿نؤتها اجرها مرتين﴾ ئەوە پاداشتی دووبەرامبەری ئەدەینەوە ﴿واعتدنا لها رزقا كريما﴾ و ڕۆزییەکی باش وبەنرخی لەبەهەشتدا بۆ ئامادە دەکەین.

### هاوسەرەکانی پێغەمبەر وەك ژنانی تر نین:

﴿[٣٢] يا نساء النبى لستن كأحد من النساء﴾ ئەی ژنانی پەیامبەر! ﷺ هەرگیز ئێوە وەك هیچ یەکێ لە ژنانیتر نین ﴿إن اتقيتن﴾ ئەگەر ئێوە لەخوا بترسن، بێ شك حیساب و پاداشتان زۆرو فراوانە ﴿فلا تخضعن بالقول﴾ دەسا لەگەڵ نامەحرەمدا قسە بەنەرمیی و ناسکیی و نازەوە مەکەن، واتە: لەکاتی وتەو گوفتاردا دەنگتان نەرم و ناسك مەکەن لەگەڵیاندا ﴿فيطمع الذى فى قلبه مرض﴾ نەوەکو ئەو کەسەی کە دڵی نەخۆشی(خراپ وبەدرەوشتی) تێدایە، تەماح بیگرێ و بوروژێت ﴿وقلن قولا معروفا﴾ ئەبێ ئێوە هەمیشە قسەی چاك و شیاو بکەن، ولەگەڵ نامەحرەمدا وا قسە نەکەن، کە لەگەڵ مێردی خۆتاندا دەیکەن، ئاشکرایە ئافرەتان و ژنانی موسڵمانیش لەم حوکمەدا، هاوبەشی ژنەکانی پێغەمبەرن،واتە:هەر ئاراستەو فەرمانێك بۆ ئەوان دەرچوو، بێ شك بۆ ئەمانیشە.

### وەك دەورانی زووی نەزانی پێشوو خەملی خۆتان نیشان مەدەن:

﴿[٣٣] وقرن فى بيوتكن﴾ (ئەی ژنانی پێغەمبەر!) دەبێ ئێوە لەماڵەکانی خۆتاندا بسرەوون وئوقرە بگرن، واتە: بێکاری پێویست لەماڵ دەرنەچن ﴿ولا تبرجن تبرج الجاهلية الأولى﴾ نابێ ئێوە وەك سەردەمی جاهیلیەتی زوو،

---

الجزء الثاني والعشرون — سورة الأحزاب

وَمَن يَقْنُتْ مِنكُنَّ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتَعْمَلْ صَٰلِحًا نُّؤْتِهَآ أَجْرَهَا مَرَّتَيْنِ وَأَعْتَدْنَا لَهَا رِزْقًا كَرِيمًا ﴿٣١﴾ يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِىِّ لَسْتُنَّ كَأَحَدٍ مِّنَ ٱلنِّسَآءِ ۚ إِنِ ٱتَّقَيْتُنَّ فَلَا تَخْضَعْنَ بِٱلْقَوْلِ فَيَطْمَعَ ٱلَّذِى فِى قَلْبِهِۦ مَرَضٌ وَقُلْنَ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ﴿٣٢﴾ وَقَرْنَ فِى بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ٱلْأُولَىٰ ۖ وَأَقِمْنَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتِينَ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِعْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجْسَ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا ﴿٣٣﴾ وَٱذْكُرْنَ مَا يُتْلَىٰ فِى بُيُوتِكُنَّ مِنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱلْحِكْمَةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ لَطِيفًا خَبِيرًا ﴿٣٤﴾ إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَٰتِ وَٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ وَٱلْقَٰنِتِينَ وَٱلْقَٰنِتَٰتِ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلصَّٰدِقَٰتِ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰبِرَٰتِ وَٱلْخَٰشِعِينَ وَٱلْخَٰشِعَٰتِ وَٱلْمُتَصَدِّقِينَ وَٱلْمُتَصَدِّقَٰتِ وَٱلصَّٰٓئِمِينَ وَٱلصَّٰٓئِمَٰتِ وَٱلْحَٰفِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَٱلْحَٰفِظَٰتِ وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا ﴿٣٥﴾

وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ — ٤٢٢

زینەت و جوانی خۆتان بۆ پیاوان دەربخەن، ئەوەبوو ژنانی ئەوسەردەمە، بێ کاری پێویست لە ماڵەوە دەردەچوون وجوانیی وزینەتی خۆیانیشیان دەرئەخست! ﴿واقمن الصلاة وآتين الزكاة﴾ و بەجوانی وبەردەوام , نوێژەکانتان ئەنجام بدەن و، زەکاتیش بدەن ﴿وأطعن الله ورسوله﴾ و هەردەم فەرمانبەرداری خواو پەیامبەری ئەو بن و ﴿إنما يريد الله ليذهب عنكم الرجس أهل البيت﴾ بەڕاستی لەم – ئاراستانەدا– خوا هەر ئەیەوێ هەموو چڵك و چەپەڵی و، گشت کارێکی ناڕەواو نا دروستان لێ دوور بخاتەوە (ئەی خانەوادەی پێغەمبەر!) ﴿ويطهركم تطهيرا﴾ و بەپوختیی و پاکی بتانهێڵێتەوەو راتان بگرێ. هەندێ لە زانایان پێیان وایە کە لەم ئایەتی: (..أهل البيت ويطهركم تطهيرا)دا ژنەکانی پەیامبەر ﷺ بەرناکەون! خۆ گومانیش لەوەدا نییە کە هەموو بەرئەکەون، وەك (ئیبن کەسیر) دەڵێ، چونکە: یەکەم: داڕشتنی ئایەتەکانی پێشەوە بەم شێوەیە: (قل لأزواجك إن كنتن تردن..) پاشان هێنانی ئایەتی (إنما يريد الله ليذهب..) بۆ دواتریش ئایەتی (واذكرن..) پڕبەپڕ لەگەڵ ئەوانیەتی و هەموو لەگەڵ ئەوان قسە دەکەن، (ئوصول)ییەکانیش یەك دەنگن لەوەدا کە هەر شتێك بەیەقین بەر بکەوێ لەبڕیارێکدا، نابێ جیا بکرێتەوە.

دووەم: لەسوورەتی (١١) کەدەفەرموێ: (قالوا أتعجبين من أمر الله رحمة الله وبركاته عليكم أهل البيت) مەبەست بە (أهل البيت) ژنەکەی (ئیبراهیم) ﷺ پێغەمبەرە، کەوابوو لێرەیش مەبەست بە (أهل البيت) ژنەکەنانی پێغەمبەرە ﷺ، ئەگەرچی (عەلی کوڕی ئەبی تالب و فاطمە و حەسەن و حوسەین) یش خوا لێیان رازی بێت بەر ئەکەون، چونکە پەیامبەر ﷺ پێی فەرموون: ((إنهم أهل البيت)) سەیری تەفسیری (ئیبن کەسیر) بکە.

## فێری ئایەتەکانی قورئان و فەرموودەکان بن:

﴿[٣٤] واذكرن ما يتلى في بيوتكن من آيات الله والحكمة﴾ و یاد بگرن ئەوەی دەخوێنرێتەوە لە ماڵەکانتاندا لەئایەتەکانی خواو فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺ،واتە: مادەم ئێوە ماڵەکانتان جێگەی سروش و نیگای خوایە، ئەبێ زۆر صالح و چاك و پاك بن ﴿إن الله كان لطيفا خبيرا﴾ بەڕاستیی خوا بە لوتفە بە دۆستانی, بە ئاگایە بە هەموو خەڵك ودروستکراوێکی خۆی, بۆیە بەهەموو کارو کردەوەیەکتان دەزانێ، و ئەشزانێ چی چاکە بۆ ئەم ژینەیان و بۆ قیامەتتان.

## ژن و پیاوی موسڵمان فەرقێکیان نییە لە پاداشتدا ولێبوردنی خوایی دا:

ئیمامی (موسلیم) دەڵێ: (ئوم سەلەمە –خوای لێ رازی بێ– بەپێغەمبەری وت: بۆچی لەقورئاندا هەر باسی پیاوان دەبیسم، بۆژنان نێو نا برێن..؟! ئەوجا ئیتر خوای گەورە ئایەتی: (إن المسلمين والمسلمات..)ی ناردە خوارەوەو فەرمووی: ﴿[٣٥] إن المسلمين والمسلمات﴾ بەڕاستیی پیاوانی موسڵمان و، ژنانی موسڵمان ﴿والمؤمنين والمؤمنات﴾ وپیاوانی بڕوادارو ژنانی بڕوادار ﴿والقانتين والقانتات﴾ وپیاوانی ملکەچ وفەرمانبەردار، ژنان ملکەچ و فەرمانبەردار ﴿والصادقين والصادقات﴾ و پیاوانی راستگۆو ژنانی راستگۆ ﴿والصابرين والصابرات﴾ و پیاوانی خۆگرو بەئارام و، ژنانی خۆگرو بەئارام ﴿والخاشعين والخاشعات﴾ وپیاوانی خۆبە کەمزان و لەخوا ترس و، ژنانی خۆ بەکەمزان و لەخوا ترس ﴿والمتصدقين والمتصدقات﴾ و پیاوانی بەخشندە، ژنانی بەخشندەی ماڵ ودارایی ﴿والصائمين والصائمات﴾ و پیاوانی رۆژووەوان و، ژنانی رۆژووەوان ﴿والحافظين فروجهم والحافظات﴾ و پیاوانی داوێن پارێز و، ژنانی داوێن پارێز، واتە: ئەوانەی کە ئەدەبی خۆیان لە کاری ناشەرعیی دەپارێزن ﴿والذاكرين الله كثيرا والذاكرات﴾ ئەو پیاوو ژنانەی کە زۆر یادی خوا ئەکەن، ﴿أعد الله لهم مغفرة وأجرا عظيما﴾ خوا لێبوردن و پاداشتێکی زۆر مەزن و گەورەی بۆ ئامادەکردوون.

**ژن و پیاوی موسڵمان، نابێ له فه‌رمانی خوا ده‌رچن:**

پێشه‌وا ئه‌حمه‌د له (ئیبن عه‌باس)ه‌وه ده‌گێڕته‌وه‌و ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ر ﷺ (زه‌ینه‌ب)ی کچی(جه‌حش) ی خواست بۆ (زه‌یدی کوڕی حاریس)ه‌، به‌ڵام زه‌ینه‌ب پێی عه‌یب بوو مێردی پێ بکاو، بۆخۆیشی ژنێکی زۆر ته‌بیعه‌ت توندبوو، بۆیه وتی: من له‌ڕووی حه‌سه‌ب و ڕشته‌وه زۆر له‌و باشترم! ئه‌وجا خوا فه‌رمووی: ﴿[٣٦] وما كان لمؤمن ولا مؤمنة﴾ بۆ هیچ پیاوو ژنێکی بڕوادار نیه ﴿إذا قضى الله ورسوله امرا﴾ کاتێ خواو په‌یامبه‌ره‌که‌ی بڕیاری کارێکیان دا ﴿أن يكون لهم الخيرة من امرهم﴾ سه‌رپشککرانیان بۆهه‌بێ له کاره‌که‌یاندا، واته: بۆیان نیه خۆیان بارێك هه‌ڵبژێرن، به‌ڵکو ده‌بێت بێ سه‌رلێکردنه‌وه فه‌رمانبه‌ردارو ملکه‌چ بن. هه‌روه‌ك له‌ئایه‌تی: (فلا وربك لا يؤمنون حتى يحكموك فيما شجر بينهم..) ٤/٦٥ دا هاتووه‌و، پێغه‌مبه‌ریش ده‌فه‌رمووێ: ((لايؤمن احدكم حتى يكون هواه تبعا لما جئت به)) ئه‌مانه گشت ئه‌و ڕاستیه دووپات ده‌که‌نه‌وه که ده‌بێ موسڵمان هه‌میشه گوێڕایه‌ڵی له خواو له پێغه‌مبه‌ره‌که‌ی بکه‌ن و، نابێ بۆ خۆی -بێجگه له‌وه- بڕیارێکی تر بدات. (ئیبن که‌سیر)یش ئه‌ڵێت: ئه‌م ئایه‌ته هه‌موو بواره‌کانی ژیان ده‌گرێته‌وه، که‌وابوو هه‌رکات خواو په‌یامبه‌ره‌که‌ی ﷺ بڕیاری شتێکیان فه‌رموو له هه‌ر بوارێکدا، ئیتر ئه‌بێ هه‌رئه‌وه پیاده بکرێ، ئه‌گینا یاخیبوون وسه‌رپێچیه: ﴿ومن يعص الله ورسوله﴾ هه‌رکه‌سێك سه‌رپێچی بکات له‌فه‌رمانی خواوپه‌یامبه‌ره‌که‌ی ﷺ به‌وشێوه‌یه که جگه له‌بڕیاره‌کانی ئه‌وان- کارێکی دی هه‌ڵبژێرێ بۆخۆی ﴿فقد ضل ضلالا مبينا﴾ ئه‌وه بێگومان گومڕا بووه‌،به گومڕابوونێکی ئاشکرا.

**پێغه‌مبه‌ر ﷺ قه‌ڵای به‌کوڕ کردن ده‌ڕوخێنێ:**

﴿[٣٧] وإذ تقول للذى انعم الله عليه وانعمت عليه﴾ ئه‌ی په‌یامبه‌ر! ﷺ وه‌بیر بێنه کاتێ به (زه‌ید) ئه‌وه‌ی خوا چاکه‌ی له‌گه‌ڵ کرد به هێنانی به‌ره‌و ئیمان وئیسلام ، خۆیشت

سُورَةُ الأَحْزَابِ — الجزء الثاني والعشرون

وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ
لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا
مُّبِينًا ﴿٣٦﴾ وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِىٓ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ
أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَٱتَّقِ ٱللَّهَ وَتُخْفِى فِى نَفْسِكَ مَا ٱللَّهُ
مُبْدِيهِ وَتَخْشَى ٱلنَّاسَ وَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَىٰهُ ۖ فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ
مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَٰكَهَا لِكَىْ لَا يَكُونَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِىٓ
أَزْوَٰجِ أَدْعِيَآئِهِمْ إِذَا قَضَوْا۟ مِنْهُنَّ وَطَرًا ۚ وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا
﴿٣٧﴾ مَّا كَانَ عَلَى ٱلنَّبِىِّ مِنْ حَرَجٍ فِيمَا فَرَضَ ٱللَّهُ لَهُۥ ۖ سُنَّةَ ٱللَّهِ فِى
ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلُ ۚ وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ قَدَرًا مَّقْدُورًا ﴿٣٨﴾ ٱلَّذِينَ
يُبَلِّغُونَ رِسَٰلَٰتِ ٱللَّهِ وَيَخْشَوْنَهُۥ وَلَا يَخْشَوْنَ أَحَدًا إِلَّا ٱللَّهَ ۗ وَكَفَىٰ
بِٱللَّهِ حَسِيبًا ﴿٣٩﴾ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن
رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴿٤٠﴾
يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا ﴿٤١﴾ وَسَبِّحُوهُ بُكْرَةً
وَأَصِيلًا ﴿٤٢﴾ هُوَ ٱلَّذِى يُصَلِّى عَلَيْكُمْ وَمَلَٰٓئِكَتُهُۥ لِيُخْرِجَكُم
مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ۚ وَكَانَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَحِيمًا ﴿٤٣﴾

٤٢٣

چاکه‌ت له گه‌ڵکرد به‌په‌روه‌رده‌کردنی و ئازادکردنی له کۆیلایه‌تی ده‌گوت: ﴿امسك عليك زوجك واتق الله﴾ ژنی خۆت ڕاگره‌و له‌خوا بترسه‌و، لای خۆت بیهێڵه‌ره‌وه‌و ته‌ڵاقی مه‌ده ﴿وتخفى فى نفسك ما الله مبديه﴾ وشتێکیش که‌خوا ئاشکرای ده‌کات، تۆ له‌دڵ وده‌رونی خۆتا ده‌یشاریته‌وه! واته: خوا ده‌یه‌وێ (زه‌ید) زه‌ینه‌ب ته‌ڵاق بداو تۆش ماره‌ی بکه‌یت. له‌لایه‌ن خواوه ئاگادار کرابووی که‌ده‌ره‌نجام ده‌بێ تۆ زه‌ینه‌ب ماره بکه‌یت، ئه‌گه‌رچی ئه‌مڕۆش ژنی زه‌یده‌، چونکه خوا ئه‌یه‌وێ به‌و کارو کرده‌وه‌یه یاسایه‌کی سه‌رده‌می نه‌فامیی هه‌ڵوه‌شێنێته‌وه، ئه‌وه‌بوو له‌یاسای ئه‌واندا ژنی به‌کوڕکراو یاساغ بوو ماره بکرێت، وه‌کو کوڕی پشتی خۆی داده‌نرا، ژنه‌که‌یشی ده‌بوویه بووکی! دیاره دڕکاندن وئاشکراکردنی کارێکی ئاوا لای خه‌ڵکی ئه‌و سه‌رده‌مه شتێکی زۆر گران و قورس بوو، چونکه تا ئێستا باو نه‌بووه هیچ که‌سێك ژنی به‌کوڕکراوی خۆی ماره بکات. **پێویسته بگوترێ:** هه‌ندێ له‌دوژمنانی ئیسلام بۆ

ناشیرین کردنی شۆرەت و سومعەی پەیامبەر ﷺ پەنایان بردۆتە بەر هەندێ قسەو قسەلۆکی بێ ناوەڕۆك و دوور لەڕاستیی کە بەداخەوە لەهەندێ تەفسیرەکانیشدا هاتووە.. دیسانەوە زۆر بەداخەوە بڕێ لەنووسەرەکانی خۆیشمان بێ سەر لێکردنەوەئەوقسانە دەهێنن ولە نووسراوەکانیاندا بلاوی دەکەنەوە! گوایە بەگومانی ئەوان جارێك پێغەمبەرﷺ ئەڕوات بۆ ماڵی زەیدو، زەیدیش -لەو کاتەدا- لەماڵەوە نابێت، زەینەب پێشوازیی دەکات، جاکاتێ کە پێغەمبەرﷺ دەیبینێت کتوپڕ خۆشەویستیی زەینەب دەچێتە دڵیەوەو ئەڵێ: (سبحان الله مُقَلِّبَ القلوب!) زەینەب ئەمە ئەبیستێ و پاشان بۆ زەیدی دەگێڕێتەوە، ئەوسا ئەویش نیازی تەلاقدانی ئەکات، پەیامبەریش پێی ئەڵێت: (أمسك عليك زوجك)!!، جا قورئان - بۆ درکاندنی ئەو راستیە- دێتە خوارەوەو عیتابی لێ ئەکات لەسەر ئەوە کە بۆچی شەرم دەکات لەخەڵکی بۆ مارەکردنی ژنی بەکوڕ کراوی خۆی!.. کە بڕیاری خوای لەسەرە. ئەم جۆرە ریوایەتانە وەك (ئەبو بەکری ئیبنولعەرەبی) ئەڵێت: ئەوجۆرە قسەو باسانە بۆ زاتێکی وەکو پێغەمبەر زۆر زۆر لەراستییەوە دوورە، چونکە هەر ئایەتی: (وتخفى في نفسك ما الله مبديه..) بەڵگەی ناڕاستیی وپووچەڵیی ئەو ریوایەتەیە،وە بەپێی ریوایەتەکە ئەبێ خوا عیشقی (زەینەب)ی لە دڵی پەیامبەردا ئاشکرا کردبێت بۆ خەڵکی!! دە ئایا خوا عیشق وئەوینی زەینەبیدەرخست، یان ئەوەی دەرخست کە ئەبێ زەینەبی ژنی بەکوڕکراوی مارە بکا؟ هەرچەندە زۆریش شەرم بکات، هەتا قەڵای بەکوڕ کردنی پێهەڵوەشێنێتەوە؟.شیاوی باسە کاتی خۆی خاتوو خەدیجە زەیدی کوڕی حاریسەی کڕیی و بەخشیی بەپەیامبەر، ئەویش پاش ماوەیەك ئازادی کردو بەپێی باوی ئەوسەردەمەش کردی بەکوڕی خۆیی و، (زەینەب)ی پورزای خۆیی لێ مارە کرد..). پاشان ئەفەرموێ: (فلما قضى زيد منها وطرا زوجناكها لكيلا يكون على المؤمنين حرج في أزواج أدعيائهم..). خەڵکینە بیر بکەنەوەو تێفکرێن: ئایا گلەیی لەکەسێك ئەکرێ لەبەرامبەر ئەوەوە کە خۆشەویستی خۆی ئاشکرا نەکردووە لەگەڵ ژنی دراوسێکەیدا؟! حاشا کە هەرگیز پەیامبەر ﷺ شتی وا بکات.. عیشق و ئەوینی ژنێك لە دڵیا بێت و نەیدرکێنێت کە پێشتریش هیچ بەرگرییەك نەبووبێت لە مارە کردنیدا، بەڵام ئێستا بیەوێ شتی وا بکات، من پێم وایە پیاوێکی خاوەن شەرەفی دنیاییش هەرگیز ئەوە ناکات، چ جای پەیامبەرێکی خاوەن ئەخلاق و قییەم. کەخوا پێیدەفەرموێ: (وإنك لعلى خلق عظيم). راستی ئەو رووداوە ئەوەبوو باسمان کرد کە: خوا پەیامبەریﷺ ئاگادار کردبوو کە دەرەنجام هەر ئەبێ زەینەب مارە بکات، ئەگەرچی ئێستاش ژنی زەیدی بەکوڕکراوتە، زۆریش بەلاتەوە کارێکی گران و قورسە! جا ئەوە بوو کاتێ کە (زەید) هات وسکالای لەزەینەب خان کرد، پێغەمبەر ﷺ پێی نەگوت: تەلاقی بدە، بەڵکو وتی: (أمسك عليك زوجك). شیاوی باسیشە ئیمامی (تەبەری) و (ئیبن کەسیر) و (قورتوبی) هەر بەم جۆرەیان وتووە و ڕاو بۆچوونەکانیتریان هەموو رەت کردۆتەوە.سەیرێکی(فتح الباري: ٨/ ٦٦٤، چ ٣ ساڵی ١٤٢١ ك -٢٠٠٠ ز بکە، لە تەك تەفسیری قورتوبیی ب٧ ل١٧٢ی چاپی ساڵی ١٤١٥ك - ١٩٩٥ز. ﴿وتخشى الناس والله احق ان تخشاه﴾ تۆ دەترسیت مەردم بڵێن موحەممەدﷺ ژنی کوڕەکەی خۆی مارە کردووە، خۆخوا شایستەترەو لەپێشترە تۆلێی بترسیت و فەرمانی جێبەجێ بکەیت ﴿فلما قضى زيد منها وطرا زوجناكها﴾ ئینجا کە زەید زەینەبی خواست و بووبە هاوسەری، پاشان پێکەوە نەیانکراو تەلاقییداو جیا بوونەوە، ئێمە لە تۆمان مارە کرد. ئەمە بەڵگەیەکی تەواو ئاشکرایە کە ئەوشتەی پەیامبەر ﷺ حەزی نەدەکرد بیدرکێنێ.. مارە کردنی زەینەب خان بوو دوای تەڵاقدانی،چونکەلای ئەوان بووکیەتی، بووکیش مارە ناکرێ ﴿لكيلا يكون على المؤمنين حرج في أزواج أدعيائهم﴾ خوا ئەو بڕیارەیدا تا هیچ دڵتەنگیی و گرفتێك بۆ بڕواداران لە مارە کردنی ژنی بەکوڕکراویان

دروست نەبێ و، بەشتێکی ناشرین وناپەسەندی دانەنێن ﴿إذا قضوا منهن وطرا﴾ کاتێ ئەو کورانە تەمابڕ ببن لێیان و تەلاقیان بدەن ﴿وکان أمر الله مفعولا﴾ بڕیاری خوایش بۆ مارەکرکردنی زەینەب، شتێکی بڕاوەیەو، هەر دەبێ جێبەجێ بکرێت ﴿[٣٨] ماکان علی النبی من حرج فیما فرض الله له﴾ هیچ جۆرە هەڵە وگوناهێك لەسەرشانی پەیامبەر ﷺ نییە لەبەرامبەر هەربریارێکەوە خوا بۆیدابێ،واتە: هەرشتێکی بۆ حەڵاڵکردبێ بۆیڕەوایە ﴿سنة الله فی الذین خلوا من قبل﴾ ئەمە سوننەت و یاسای خوایە بەرامبەر بەو پەیامبەرانەش بەر لە تۆ بوون، هەرگیز بڕیارێکی بۆ نەداون بە کەسایەتییان زیانبەخش بێت ﴿وکان أمر الله قدرا مقدورا﴾ بەردەوامیش فەرمان و بڕیاری خوا زۆر بەوردیی پێشدێ وجێبەجێ دەکرێ و، هیچ کەسێکیش بۆی نییە دەسکاری بکاو بیگۆڕێ.

## گەیەنەرانی پەیامەکانی خوا، بەدەر لەخوا، لە هیچ ناترسن:

﴿[٣٩] الذین یبلغون رسالات الله ویخشونه﴾ ئەوانە وا فەرمان و پەیامەکانی خوا دەگەیەنن ولێی دەترسن ﴿ولا یخشون أحدا إلا الله﴾ وە لەهیچ کەسێکی تر ناترسن, جگە لە خودا جاکەواتە تۆیش ئەی پێغەمبەر!ﷺ هەر لەوان پەیڕەوی بکە. بۆیە ئەو پێغەمبەرە هەم خۆیی و هەم هاوەڵانیشی زۆر بوێرانە پەیامەکەی خوایان گەیاندو، شەوو رۆژ لێی نەوەستان.﴿وکفی بالله حسیبا﴾ وخوا خۆیشی بەسە چاودێرو لێپرسەرەوە بێت.

## پێغەمبەر ﷺ ئاخری هەموو پێغەمبەرانە:

﴿[٤٠] ماکان محمد أبا أحد من رجالکم﴾ موحەممەد ﷺ باوکی هیچ پیاوێکتان نییە, نە زەیدو نە کەسی دیکەتان هەتا حەرام بێت ژنی بە کوڕکراوی خۆی- پاش تەلاقدانی- مارەبکات، چونکە کچ وکوڕی ئەوئاشکران وبێ لەوان کەسیتر نابێتە کچ وکوڕی، بۆیە دەتوانێ ژنەکەی زەید مارە بکات ﴿ولکن رسول الله وخاتم النبیین﴾ بەڵکوئەو پەیامبەری خوایەو دواهەمینی پەیامبەرانە، کۆتایی زنجیرەی پەیامبەرانی پێهاتووە. (ئیبن عەبباس) ئەڵێت: مەبەست ئەوەیە کە ئەگەر ئەوئاخر پەیامبەر نەبووایە، خوا کوڕێکی دەدایەو دەیکردە پەیامبەر ﴿وکان الله بکل شئ علیما﴾ هەمیشەیش خوا بە هەموو شتێك زاناو بەئاگایە.

## ئیمانداران فرە یادی خوا بکەن:

﴿[٤١] یا أیهاالذین آمنوا اذکروا الله ذکر کثیرا﴾ ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە! یادی خوا بکەن یادێکی زۆر, واتە: بێ حەدو سنور یادی یادی خوابکەن. ﴿[٤٢] وسبحوه بکرة وأصیلا﴾ وە هەموو بەیانی و ئێوارەیەك خوا بەپاك وخاوێن رابگرن و هەردەم "سبحان الله بڵێن" ﴿[٤٣] هو الذی یصلی علیکم وملائکته﴾ ئەو خوا میهرەبانەیە بەردەوام صەڵەواتتان لێدەداو، فریشتەکانیشی داوای لێبوردنتان بۆ ئەکەن ﴿لیخرجکم من الظلمات إلی النور﴾ تا لەتاریکییەکانی شیرك و نەزانی و گومڕایی دەرتان بکات و بەرەو نوورو رووناکی ئیمان بتانبات ﴿وکان بالمؤمنین رحیما﴾ خواش بەردەوام لەگەڵ بڕواداران میهرەبان و دلۆڤانە ﴿[٤٤] تحیتهم یوم یلقونه سلام﴾ ئەو رۆژەش کە بەدیداری ئەو دەگەن رێزو تەحیەیان سەلامە، بەسڵاو کردن لەلایەن خوای میهرەبانەوە، پێشوازییان لێدەکرێت، وە ئەفەرمووێ: (سلام قولا من رب رحیم). ﴿وأعد لهم أجرا کریما﴾ وە پاداشێکی زۆر چاکیشی بۆ ئامادە کردوون.

## هەندێ لە پەسنەکانی پێغەمبەر ﷺ:

تەبەرانیی لە(ئیبن عەبباس) دەڵێ: کاتێ کە ئایەتی: ﴿[٤٥] یا أیها النبی إنا أرسلناك شاهدا ومبشرا ونذیرا﴾ هاتە خوارێ، پێغەمبەرﷺ (عەلیی و موعاز)ی ناردە (یەمەن) و پێی فەرموون: (إنطلقا فبشرا ولا تنفرا، ویسرا ولا تعسرا)

هەر دووبچن و مزگێنی دەربن و خەڵکی مەتۆرێنن، ئاسانکار بن وسەختگیر مەبن، چونکە ئەوئایەتەم: بۆ هاتۆتە خوارێ وپێم دەڵێ: ئەی پێغەمبەر! ئێمە تۆمان ناردووە بە مژدە دەرو ترسێنەر، واتە: بە شاهید لەسەر خەڵك، وە بە مژدە دەر بۆ بڕوادارەکان، وە بە ترسێنەریش بۆ بێ بڕواکان. واتە: ببیتە شایەدی یەکتاپەرەستیی و، کارو کردەوەی مەردم لە رۆژی بەرێدا، بە بڕوادارانیش مزگێنی پاداشی زۆر وبێ سنوور بدەیت و، خوانەناسانیش بەپاشەرۆژی سەخت بترسێنیت, کەوابوو دەبێ ئێوەش ئەی موسڵمانان!موژدە بەخشبن. ﴿٤٦ وداعیا إلى الله بإذنه﴾ خەڵکیش بانگ کەیت – بە فەرمانی خوا– بۆ یەکتاپەرستیی ﴿وسراجا منیرا﴾ و بشبیتە چرایەکی نورانیی و رووناك بۆخەڵکانی جیهان، ﴿٤٧ وبشر المؤمنین بأن لهم من الله فضلا کبیرا﴾ موژدەش بدە بە بڕواداران بەوەی کە: لە خواوە زیادە پاداشتێکی گەورەیان بۆ هەیە ﴿٤٨ ولا تطع الکافرین والمنافقین﴾ هەرگیز گوێڕایەڵ و بەر فەرمانی بێ بڕوایان و دووڕووەکان مەبە ﴿ودع اذاهم﴾ و گوێ مەدە بەو ئەزیەت و ئازارەی پێشت دێنن ﴿وتوکل على الله﴾ و لەتەواوی کاروباتا هەمیشە پشت بەخوا ببەستە ﴿وکفى بالله وکیلا﴾ تەنها خواش بەسە پارێزەرو یاریدەدەر بێت.

**ئەحکامی ژنی تەلاقدراو بەرلە چوونە لای:**

﴿٤٩ یا أیها الذین آمنوا إذا نکحتم المؤمنات﴾ ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە! کاتێ ژنانی بڕوادارتان مارە کردن ﴿ثم طلقتموهن من قبل ان تمسوهن﴾ لەپاشا تەلاقتاندان پێش ئەوەی کە بچنە لایان ﴿فما لکم علیهن من عدة تعتدونها﴾ هیچ "عیددە" و ماوەیەکتان بەسەریانەوە نیە رێگر بێ بۆ شوو کردنەوەیان، واتە: بێ عیددە بۆیان هەیە مێرد بکەنەوە، چونکە عیددە بۆ ئەوەیە دەرکەوێ ئاخۆ سکی هەیە، یانە؟﴿فمتعوهن﴾ جا موتعەیان بدەنێ، موتعە:ماڵێکە وەك جل و بەرگ و پۆشاك و.. هتد بۆ ئاسانکردنی تەلاقدانەکە لەسەر شانیان ﴿وسرحوهن سراحا جمیلا﴾ وە بەجوامێرانە دەسیان لێبەر بدەن. واتە: بە بێ زیان دان لێیان تووشی ئەزیەت و ئازاریان مەکەن. (ئیبن کەسیر) دەڵێ: ئەم ئایەتە چەند حوکمێکی گرنگی تێدایە:

الجزء الثاني والعشرون — سورة الأحزاب

تَحِيَّتُهُمْ يَوْمَ يَلْقَوْنَهُ سَلَامٌ وَأَعَدَّ لَهُمْ أَجْرًا كَرِيمًا ﴿٤٤﴾ يَا أَيُّهَا
النَّبِيُّ إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ﴿٤٥﴾ وَدَاعِيًا
إِلَى اللَّهِ بِإِذْنِهِ وَسِرَاجًا مُنِيرًا ﴿٤٦﴾ وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ بِأَنَّ لَهُمْ
مِنَ اللَّهِ فَضْلًا كَبِيرًا ﴿٤٧﴾ وَلَا تُطِعِ الْكَافِرِينَ وَالْمُنَافِقِينَ
وَدَعْ أَذَاهُمْ وَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ وَكَفَىٰ بِاللَّهِ وَكِيلًا ﴿٤٨﴾
يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَكَحْتُمُ الْمُؤْمِنَاتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ
مِنْ قَبْلِ أَنْ تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا
فَمَتِّعُوهُنَّ وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ﴿٤٩﴾ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِنَّا
أَحْلَلْنَا لَكَ أَزْوَاجَكَ اللَّاتِي آتَيْتَ أُجُورَهُنَّ وَمَا مَلَكَتْ
يَمِينُكَ مِمَّا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَيْكَ وَبَنَاتِ عَمِّكَ وَبَنَاتِ عَمَّاتِكَ
وَبَنَاتِ خَالِكَ وَبَنَاتِ خَالَاتِكَ اللَّاتِي هَاجَرْنَ مَعَكَ وَامْرَأَةً
مُؤْمِنَةً إِنْ وَهَبَتْ نَفْسَهَا لِلنَّبِيِّ إِنْ أَرَادَ النَّبِيُّ أَنْ يَسْتَنْكِحَهَا
خَالِصَةً لَكَ مِنْ دُونِ الْمُؤْمِنِينَ قَدْ عَلِمْنَا مَا فَرَضْنَا
عَلَيْهِمْ فِي أَزْوَاجِهِمْ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ لِكَيْلَا
يَكُونَ عَلَيْكَ حَرَجٌ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَحِيمًا ﴿٥٠﴾

٤٢٤

یەکەم: بێژەی (نیکاح) هەر بەواتای مارە کردنە، بە تایبەت کە دەفەرمووێ: (من قبل ان تمسوهن).

دووەم: دەتوانرێ پێش تێکەڵاوی کردن ژن تەلاق بدرێ.

سێ یەم: بێژەی (المؤمنات) ژنی کیتابیش دەگرێتەوە.

چوارەم: ئیبنی عەبباس ودەستەیەك لە(سەلەف) ئەم ئایەتە دەکەنە بەڵگەی ئەوە کە تا (نیکاح) نەبێ هەرگیز تەلاق نابێ وناشکەوێ، ئیمامی (شافیعیی و، ئەحمەد)یش هەروا دەڵێن، بەڵام (ئەبوحەنیفەو مالیك) پێیان وایە کە پێش (نیکاح)یش تەلاق هەیە ودەکەوێ، بۆ نموونەی هەردوکیان (إن تزوجت فلانة فهي طالق) دەست دەدا.

فەرموودەیش هەرپشتگیری ئەوەدەکا کە تا (نیکاح) نەبێ تەڵاق نابێ وناکەوێ: (لا طلاق لابن آدم فیما لا یملك) (ئەحمەد، ئەبووداود، تیرمزیی).(لا طلاق قبل النكاح)(ئیبنی ماجە).

پێنجەم: بەکۆی دەنگی زانایان: هەرکاتێ ژنان تەڵاق دران – پێش چوونە لایان– عیددەیان لەسەر نییە، مەگەر مێردەکەی بمرێت، دیارە ئەوە دەبێ عیددەی ژنی مێرد مردوو هەڵژمێرێ.

شەشەم: موتعە: ئەم موتعەیە لەم جێگایەدا گشتگیرە، واتە: هەر ژنێك کە مارەیی بۆدانرابێت وپێش دەست تێکەڵ کردن لەتەکیا تەڵاق بدرێت نیوەی مارەییەکەی خۆی دەکەوێ وهەم بەموتعەش بۆی دادەنرێت، وەك ئەفەرموێ: (وإن طلقتموهن من قبل ان تمسوهن وقد فرضتم لهن فريضة فنصف مافرضتم)٢/٢٣٧. هەروەها ژنێکیش مارەیی بۆدیاری نەکرابێت و پێش چوونە لای تەڵاق بدرێت شتێکی بۆدادەنرێ بەناوی موتعەوە، بەڵام ئەو موتعەیەش بەپێی توانایی و دەسەڵات و، بێ توانایی و بێ دەسەڵاتی مێردەکە دادەنرێ: (لا جناح عليكم إن طلقتم النساء مالم تمسوهن أو تفرضوا لهن فريضة ومتعوهن على الموسع قدره وعلى المقتر قدره متاعا بالمعروف حقا على المحسنين) ٢/٢٣٦.

## ئەم ژنانە بۆ پێغەمبەر ﷺ حەلاڵن:

بۆ جارێکی تر دێتەوە سەر کاروباری ژنەکانی پەیامبەرﷺ وەك دەفەرمووێ: ﴿٥٠ يا ايها النبى إنا أحللنا لك أزواجك اللاتى آتيتهن أجورهن﴾ ئەی پەیامبەر ﷺ! ئێمە ئەو ژنانەمان بۆ حەڵاڵ کردووە مارەییت پێداون ﴿وما ملكت يمينك مما افاء الله عليك﴾ وە ئەو کەنیزانەش کە لەرێی غەنیمەت و فەیئەوە بوویتە خاوەنیان. واتە: کەنیزەمان بۆ حەڵاڵ کردویت کە مارەی بکەیت، ئیتر لەجەنگدا دەستت بکەوێت، یان بەهەر جۆرێکیتر، وەك (صەفیە)و (جوەیرییە) ئەوە بوو هەردووکیانی ئازاد کردو پاشان مارەی کردن، وە هەروەها خاتوو(رێحانە)و (مارییە)ش /خوا لەهەموویان رازی بێت.﴿وبنات عمك وبنات عماتك وبنات خالك﴾ هەروەها کچانی مامت و، کچانی پورەت (خووشکەزای باوکت) و کچانی خاڵت ﴿وبنات خالتك اللاتى هاجرن معك﴾ و کچانی پوورت (خوشکەزای دایکت) ئەوانەیان کە لەگەڵ تۆدا کۆچیان کردووە ﴿و امرأة مؤمنة إن وهبت نفسها للنبى﴾ هەروەها هەر ژنێکی بڕواداریش ئەگەر خۆی پێشکەش بەپەیامبەرﷺ کرد، تەنها مەبەستی خۆشەویستی خواو پەیامبەرەکەی خوایە ﷺ، وەك (خەولە). ﴿إن أراد النبى أن يستنكحها﴾ ئەگەر پەیامبەر ﷺ ویستی مارەی بکات ﴿خالصة لك من دون المؤمنين﴾ مارە کردنی خۆبەخش بەبێ مارەیی بۆ دانان و وەلی و شایەد تایبەتە بە تۆوە ئەی پێغەمبەر ﷺ، واتە: جگە لە پێغەمبەر لە بڕواداران نیە نیکاحی هیچ ژنێکی ئیمانداری خۆبەخش بکا بەبێ مارەیی و وەلی و شایەت. ﴿قد علمنا ما فرضنا عليهم فى أزواجهم وما ملكت ايمانهم﴾ بێگومان ئێمە رێ و شوێنمان بۆ ئەوان لەبارەی ژنان و کەنیزەکانیانەوە روونکردۆتەوە، چونکە بڕواداران نابێت زیاتر چوار ژنی ئازاد مارە بکەن، پاشان بەرامبەر بە کەنیزەیش چەندەیان بۆدەگونجێ، بەڵام لەگەڵ رەزامەندی (وەلیی و دانانی مارەیی و ئاگایی شایەددا، دیارە ئەوە بۆ تۆ رەهاو بەربڵاوە. ئەمەیش تەفسیری (موجاهیدو حەسەن و قەتادەو ئیبنی جەریرە) بۆ ئایەتی (قد علمنا ما فرضنا ...). ﴿لكيلا يكون عليك حرج﴾ بۆئەوەی تەنگ و چەڵەمەیەك بۆت پێش نەیەت لە مارە کردنی زیاتر لە چوار وهتد..، وەك لە ئایەتەکەدا باسکرا. روونکردنەوەیەش بۆ ئەوەیە تا هیچ دڵتەنگی و گیروگرفتێك لە گەیاندنی پەیامەکەتدا نەیەتە رێت، وە وانەزانیت بەوە کە چوار ژن زیاترت هەیە، سنوورت شکاندووە، چونکە پێویستە تۆ پەیوەندی بکەیت بەهەموو جۆرە خەڵکێکەوە –بەتایبەتی لەرێی ژنەکانتەوە– بۆ گەیاندنی بەرنامەکەی خوا ﴿وكان

الله غفورا رحیما﴾ هەمیشە خوا زۆر لێبوردەو میهرەبانە ﴿٥١ ترجي من تشاء منهن و تؤوي من تشاء﴾ تۆ دەتوانی کات و مەوعیدی هەرکامێك لەژنەکانت دوابخەیت "واتە: ئەگەر لەسەرەی ئەویشدا نەگەڕێیتەوە لای، تۆ گوناهبار نابیت، هەروەها هەرکامێکیشیان نزیك بکەیتەوەو بتەوێ لەلای تۆ بمێنیتەوە (ئەگەرچی سەرەی ئەویش نەبێ)، هەر گوناهبار نابیت، ئەم تەفسیرە بەپێی ڕاوبۆچوونی هەندێ لەو زانایانەیە، کە دەڵێن: پێغەمبەرﷺ (قەسم)ـی لەسەر واجیب نەبووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا بەوپەڕی دادپەروەرییەوە جووڵاوەتەوە، لەتەك ژنەکانیدا ﴿ومن ابتغيت ممن عزلت فلا جناح عليك﴾ هەروا ئەوەشیان کەکاتی خۆی بەرکەنارت کردبێ لە قەسم و لەلامانەوەی شەو، بەڵام ئێستا دەتەوێت لە خۆتی نزیك بخەیتەوە، دیسان بۆ ئەوەش هیچ گوناهێکت لەسەر نیە ﴿ذلك أدنى أن تقر أعينهن ولا يحزن﴾ ئابەو شێوەیە خوای میهرەبان بۆی روونکریتەوە نزیکترە بەوەی کە ژنەکانت چاویان پێیگەش بێت و خەفەت نەخۆن, چونکە دەزانن کە پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەوەیشدا قەسمی لەسەر نییە ئەو بۆخۆیی هەر ئەنجامی دەدات. بەڵێ دابەشکردنی کاتەکان بەسەر ژناندا بۆئەوانەی زیاتر لەژنێکیان هەیە کارێکی زۆر پێویست و گرنگە لەئیسلامداو زاناکان ئەم ئەدرەسەیان بۆ داناوە (باب القسم)، بەڵام بۆ پەیامبەرﷺ خوای گەورە بەوئایەتەی سەرەوە بەپێی ئەو تەفسیرە کردمان ئەو قەسمەی لەسەرشان هەڵگرت، هەرچەندە ئەو خۆی ئەوپەڕی هەوڵی ئەدا بۆ جێبەجێکردنی ﴿ويرضين بما آتيتهن كلهن﴾ وە رازیی و خۆشنوودیش بن بەو مافی ژن و مێردیەی تۆ پێتیانت داوە بێ جیاوازی لە نێوانیاندا, واتە: با ئەوانە بزانن کە تۆ (قەسم)ت لەسەر نیە بۆیان، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا کاتەکانت بۆ بەشکردون, خۆشحاڵ و دڵشاد ئەبن ﴿والله يعلم مافي قلوبكم﴾ وەخوا چاك دەزانێ بەوەی لەدڵەکانتاندا حەشاردراوە لە کاری ژنان ومەیل بۆلای هەندێکیان.﴿وكان الله عليما حليما﴾ وە خوا بەردەوام لەبەرژەوەندی بەندەکانی خۆی بەئاگایە, هەمیشە لەسەرخۆیەو پەلەی سزاش ناکات.

الجزء الثاني والعشرون — سورة الأحزاب — حزب ٤٣

﴿ تُرۡجِي مَن تَشَآءُ مِنۡهُنَّ وَتُـٔۡوِيٓ إِلَيۡكَ مَن تَشَآءُۖ وَمَنِ ٱبۡتَغَيۡتَ
مِمَّنۡ عَزَلۡتَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكَۚ ذَٰلِكَ أَدۡنَىٰٓ أَن تَقَرَّ أَعۡيُنُهُنَّ
وَلَا يَحۡزَنَّ وَيَرۡضَيۡنَ بِمَآ ءَاتَيۡتَهُنَّ كُلُّهُنَّۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ
مَا فِي قُلُوبِكُمۡۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَلِيمٗا ﴿٥١﴾ لَّا يَحِلُّ لَكَ
ٱلنِّسَآءُ مِنۢ بَعۡدُ وَلَآ أَن تَبَدَّلَ بِهِنَّ مِنۡ أَزۡوَٰجٖ وَلَوۡ أَعۡجَبَكَ
حُسۡنُهُنَّ إِلَّا مَا مَلَكَتۡ يَمِينُكَۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ رَّقِيبٗا
﴿٥٢﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتَ ٱلنَّبِيِّ إِلَّآ أَن
يُؤۡذَنَ لَكُمۡ إِلَىٰ طَعَامٍ غَيۡرَ نَٰظِرِينَ إِنَىٰهُ وَلَٰكِنۡ إِذَا دُعِيتُمۡ
فَٱدۡخُلُواْ فَإِذَا طَعِمۡتُمۡ فَٱنتَشِرُواْ وَلَا مُسۡتَـٔۡنِسِينَ لِحَدِيثٍۚ إِنَّ
ذَٰلِكُمۡ كَانَ يُؤۡذِي ٱلنَّبِيَّ فَيَسۡتَحۡيِۦ مِنكُمۡۖ وَٱللَّهُ لَا
يَسۡتَحۡيِۦ مِنَ ٱلۡحَقِّۚ وَإِذَا سَأَلۡتُمُوهُنَّ مَتَٰعٗا فَسۡـَٔلُوهُنَّ مِن
وَرَآءِ حِجَابٖۚ ذَٰلِكُمۡ أَطۡهَرُ لِقُلُوبِكُمۡ وَقُلُوبِهِنَّۚ وَمَا كَانَ
لَكُمۡ أَن تُؤۡذُواْ رَسُولَ ٱللَّهِ وَلَآ أَن تَنكِحُوٓاْ أَزۡوَٰجَهُۥ
مِنۢ بَعۡدِهِۦٓ أَبَدًاۚ إِنَّ ذَٰلِكُمۡ كَانَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمًا ﴿٥٣﴾ إِن
تُبۡدُواْ شَيۡـًٔا أَوۡ تُخۡفُوهُ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٗا ﴿٥٤﴾

٤٢٥

**بێ لەو ژنانەت، ئەی پێغەمبەرﷺ، ژنانی ترت پێناشێ:**

﴿٥٢ لا يحل لك النساء من بعد﴾ ئیتر لە دوای ئەمانە هێنانی ژنانی تر بۆ تۆ حەڵاڵ نییە، واتە: بۆت نییە ژنی تریان بەسەردا بێنی ﴿ولا أن تبدل بهن من أزواج﴾ وە ناتوانی وازیشیان لێ بێنیت "یەکێکیان تەڵاق بدەیت و یەکێکی تر مارە بکەیت، چونکە ئەوان خواو پەیامبەریان هەڵبژاردووە، خوای گەورەش ئاوا پاداشتیان ئەداتەوە" ﴿ولو أعجبك حسنهن إلا ما ملكت يمينك﴾ ئەگەرچی ئەو ئافرەتانەی کە تۆدەتەوێ بیانخەیتە جێگای هاوسەرەکانت، جوانییان سەرسامت بکات جگە لەکەنیزەك. بەڵێ خوای گەورە چوار جۆرە ژنی حەڵاڵ کرد بۆ پەیامبەرﷺ :

یەکەم: ئەوانە مارەیی پێبەخشیون و مارەی کردون.

دووەم: ئەو کەنیزانەی لەجەنگدا دەستی دەکەون، وە یان دەیانکڕێت.

سێیەم: ئەوانەی کۆچیان لەگەڵ کردووە و هاتوونەتە مەدینە.

چوارەم: ئەوانەی کەخۆیان بەپەیامبەرﷺ بەخشیی و مارەییان لێ نەویست، ئەوەیش بۆ ئەوە بوو تا پەیامبەرﷺبەهۆی زۆری خێزانەکانیەوە بتوانێت بەئاسانتر بانگەکەی بگەیەنێت بە هەموو ماڵێك، جا پاش ئەوەش کە ئایەتی تەخییر: (قل لأزواجك إن كنتن تردن الحياة الدنيا..) هات و ئەوانیش خواو پەیامبەریان ﷺ هەڵبژارد لەباتی دونیا، ئیتر خوای گەورەش ڕێزی لێنان بەم دووشتە:

یەکەم: نابێ پەیامبەر ﷺ ژنی تریان بەسەرا بێنێ.

دووەم: نابێ هیچ کامێکیان تەڵاق بدات وبیانگۆڕێ بە ژنانێ تر. ﴿وكان الله على كل شئ رقيبا﴾ خوا هەمیشە بە سەر هەموو شتێکدا چاودێرە. ئینجا قورئان شێوەی پەیوەندی موسڵمانان بە هاتوچۆی ماڵی پەیامبەرەوە ﷺ ڕێك ئەخات، ﴿[٥٣] يا أيها الذين آمنوا لا تدخلوا بيوت النبي إلا أن يؤذن لكم إلى طعام﴾ ئەی ئەوکەسانەی بڕواتان هێناوە! مەچنە ماڵەکانی پەیامبەر ﷺ مەگەر لە حاڵێکدا مۆڵەتتان بدرێت بۆ نان خواردنێك،﴿غير ناظرين إناه﴾ بە بێ چاوەڕوانی پێگەیشتنی واتە: ئەگەر دەعوەتکران بۆ نان خواردنێك زوومەچن لەوێ چاوەڕوانی بکەن تا نان وخواردنەکە پێ دەگا ﴿ولكن إذا دعيتم فادخلوا﴾ بەڵام کاتێ بانگکران وفەرموتان لێکرا بچنە ژوورەوە ﴿فإذا طعمتم فانتشروا﴾ ئینجا کە نانیشتان خوارد، زوو بڵاوەی لێبکەن ﴿ولا مستأنسين لحديث﴾ ومەمێننەوە بە هۆگرییتان بۆ قسەو باس و داستانگێڕانەوە بۆ یەکترو دەمە تەقێ ﴿إن ذلكم كان يؤذي النبي﴾ چونکە ئەو جۆرە کارانەتان پەیامبەرﷺ ئەزیەت دەدات ﴿فيستحي منكم﴾ جا پێغەمبەریش شەرمتان لێ ئەکات و داوای چوونە دەرەوەتان لێ بکات ﴿والله لا يستحي من الحق﴾ بێگومان خوا هەرگیز شەرم لە دەرخستنی هەق و ڕاستیی ناکات هەرشتێك هەق بێت بەیانی ئەکات، ئەگەرچی هەندێ کەسیش پێیان ناخۆش بێت.

**ئەدەب و وێلی چوونە ماڵی پێغەمبەرﷺ، و فەرماندان بە حیجاب:**

﴿وإذا سألتموهن متاعا فاسألوهن من وراء حجاب﴾ خۆ ئەگەر داوای شتێکتان لەژنانی پێغەمبەر ﷺ کرد، لەپشتی پەردەوە داوایان لێ بکەن، واتە: ئەدەب لەماڵی پەیامبەر ﷺ و تێکەڵ نەبوون لەگەڵ خانەوادەکەیدا یاسایەکی خواییەو، دەبێ هەموو کات پێش چاو بگیرێ ﴿ذلكم أطهر لقلوبكم وقلوبهن﴾ ئابەو شێوەیە پاکترە بۆ دڵی ئێوە و، دڵی ئەوانیش "نەك تێکەڵی ژن و پیاو کە دەرەنجام گەڵێ شتی خراپی لێ ئەوەشێتەوە". (شەنقیتیی) ئەڵێت: ئایەتی: (وإذا سألتموهن متاعا..) ئەگەرچی هەندێ لە زانایان دەڵێن: ئەو یاسایە تایبەتە بە خێزانەکانی پەیامبەرەوە ﷺ، بەڵام ئەگەر سەیری هۆو عیللەتەکەی بکرێت: (ذلكم أطهر لقلوبكم وقلوبهن..) بە ڕاشکاوی ئەوە دەگەیەنێت کە حوکمەکەی گشتگیرەو بۆ تەواوی موسڵمانانیشە، چونکە هیچ کەسێك نیە بتوانێت بڵێ: ژنانێ‌تر جگە لەژنانی پەیامبەر ﷺ پێویستیان بە ئاسوودەیی وپاکی دڵ نییە، جگە لەوەش لە (ئوصول)یشدا هاتووە: (إن العلة قد تعمم معلولها..) لەولایشەوە ئەگەر بەوردی سەیرێکی قورئان بکرێت، بە ئاسانی دەردەکەوێت کە حیجاب لەسەر تەواوی ژنە موسڵمانەکان واجبە: (ذلكم أطهر لقلوبكم..) یان دەفەرموێ: (يا أيهاالنبي قل لأزواجك وبناتك ونساء المؤمنين يدنين عليهن من جلابيبهن..) ٣٣/٥٩. بۆ ئەم ئایەتەش دەڵێت: (فقد قال غير واحد من أهل العلم: إن معنى: ((يدنين عليهن من جلابيبهن)) انهن يسترن بها جميع وجوههن، ولا يظهرن شيئا إلا عين واحدة تبصر بها،

ومـمـن قـال بـه: ابـن مسعـود، وابـن عبـاس، وعبيـدة السلمانى، وغيرهـم). بـه‌ڵێ.. (محمد ئه‌مین شه‌نقیتی) بۆچوونی ئه‌وه‌بووه به‌ڵگه‌یه‌کی زۆریشی هێناوه‌ته‌وه بۆ ئه‌وه که ده‌ست و ده‌م و چاویش عه‌وره‌ته‌و واجبه داپۆشرێ، جگه کاتی نوێژ کردن و کاتی حه‌ج ﴿وما كان لكم أن تؤذوا رسول الله﴾ بێگومان هه‌رگیز بۆ ئێوه ناشێ و نابێت ئازارو ئه‌زیه‌تی په‌یامبه‌ری خوا ﷺ بده‌ن ئیدی به زمان بێ یان به کردار. ﴿ولا أن تنكحوا أزواجه من بعده أبدا﴾ هه‌رگیزیش بۆتان نییه ژنه‌کانی دوای خۆی به‌هیچ جۆرێك ماره بکه‌ن چونکه وه‌کو دایکتانن ﴿إن ذلكم كان عند الله عظيما﴾ چونکه ئه‌زیه‌تدانی و ماره کردنی ژنه‌کانی ئه‌وڵای خوا کارێکی زۆر گه‌وره‌یه و چاوپۆشی لێناکرێ. ﴿٥٤ إن تبدوا شيئا أو تخفوه﴾ ئه‌گه‌ر ئێوه شتێك ده‌ربڕن یان بیشارنه‌وه له دڵتانا ﴿فإن الله كان بكل شئ عليما﴾ ئه‌وه به‌ڕاستیی خوا به‌هه‌مووشتێك زاناو ئاگایه. ژنان له‌مانه ڕوو ناپۆشن: به‌ڵێ هه‌ر ئه‌و کاته که ئایه‌ت هات و فه‌رمانیدا: ده‌بێ له‌پشت په‌رده‌وه قسه له‌گه‌ڵ خێزانه‌کانی په‌یامبه‌ردا ﷺ بکرێت.



لَّا جُنَاحَ عَلَيْهِنَّ فِىٓ ءَابَآئِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآئِهِنَّ وَلَآ إِخْوَٰنِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآءِ
إِخْوَٰنِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآءِ أَخَوَٰتِهِنَّ وَلَا نِسَآئِهِنَّ وَلَا مَا مَلَكَتْ
أَيْمَٰنُهُنَّ ۗ وَٱتَّقِينَ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدًا
﴿٥٥﴾ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِىِّ ۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُوا۟ صَلُّوا۟ عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا۟ تَسْلِيمًا ﴿٥٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ
ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ وَأَعَدَّ لَهُمْ عَذَابًا
مُّهِينًا ﴿٥٧﴾ وَٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ
بِغَيْرِ مَا ٱكْتَسَبُوا۟ فَقَدِ ٱحْتَمَلُوا۟ بُهْتَٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴿٥٨﴾
يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَآءِ ٱلْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ
عَلَيْهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ ۗ وَكَانَ
ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٥٩﴾ ۞ لَّئِن لَّمْ يَنتَهِ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ
فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَٱلْمُرْجِفُونَ فِى ٱلْمَدِينَةِ لَنُغْرِيَنَّكَ
بِهِمْ ثُمَّ لَا يُجَاوِرُونَكَ فِيهَآ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٦٠﴾ مَّلْعُونِينَ ۖ
أَيْنَمَا ثُقِفُوٓا۟ أُخِذُوا۟ وَقُتِّلُوا۟ تَقْتِيلًا ﴿٦١﴾ سُنَّةَ ٱللَّهِ فِى
ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلُ ۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ ٱللَّهِ تَبْدِيلًا ﴿٦٢﴾

نصف الحزب ٤٣



### ژنان له‌مانه ڕوو ناپۆشن:

ئیتر باوك و کوڕو مه‌حره‌مه‌کانی تریان هاتن و وتیان: ئایا بۆ ئێمه‌یش هه‌ر ده‌بێ وابێ ئه‌ی په‌یامبه‌ری خوا ﷺ؟! ئه‌وسا بۆ وه‌ڵامی ئه‌وه ئه‌م ئایه‌ته هات و فه‌رمووی: ﴿٥٥ لا جناح عليهن فى آبائهن ولا أبنائهن ولا إخوانهن ولا أبناء إخوانهن ولا أبناء أخواتهن ولا نسائهن ولا ما ملكت أيمانهن﴾ هیچ گوناحێك له‌سه‌ر "خێزانه‌کانی په‌یامبه‌ر ﷺ نییه – ئه‌ڵبه‌ت ژنانی تریش هه‌روا– که بێ په‌رده‌و ڕووبه‌ڕوو له‌گه‌ڵ باوك و کوڕو برازاو خوشکه‌زاو ژنانی موسڵمان و به‌نده‌ی خۆیاندا قسه بکه‌ن" چونکه په‌رده له‌گه‌ڵ ئه‌وانه‌دا ئه‌زیه‌ت و کارێکی گرانه و ئه‌وانه‌یش مه‌ترسی کاری دزێو وخراپیان لێناکرێت. ﴿واتقين الله﴾ وه "به نهێنی و به ئاشکرا، له‌خوا بترسن و سنووره‌کانی مه‌شکێنن ﴿إن الله كان على كل شئ شهيدا﴾ به ڕاستیی خوا به‌سه‌ر هه‌موو شتێکه‌وه شایه‌دو هه‌میشه ئاگایه ,وهیچ شتێکی لێ ون نابێت.

فه‌رماندان به صه‌ڵاوات له سه‌ر پێغه‌مبه‌رﷺ و, قه‌درو ڕێزی ئه‌و له‌ناو کوڕو کۆمه‌ڵ دا، هه‌ر چۆنێك له ماڵه‌وه حورمه‌ت و ڕێزی واجبه، بۆیه ئه‌فه‌رمووێ: ﴿٥٦ إن الله وملائكته يصلون على النبى﴾ به‌ڕاستیی خواو فریشته‌کانی دروود وصه‌ڵه‌وات له‌سه‌ر پێغه‌مبه‌ر ﷺ ده‌ده‌ن، خوا به‌زه‌یی و میهره‌بانی خۆی ئه‌ڕێژێ به‌سه‌ریا، فریشته‌کانیش داوای پایه به‌رزیی و لێبوردنی بۆده‌که‌ن ﴿ياأيها الذين آمنوا صلوا عليه وسلموا تسليما﴾ ده‌سا ئێوه‌ش ئه‌ی ئه‌وانه‌ی بڕواتان هێناوه! دروودو (صه‌ڵه‌وات)ی له‌سه‌ر بده‌ن، وه سه‌لامی لێبکه‌ن ئێمه‌ش ده‌ڵێین: (اللهم صل على النبى وسلم تسليما). یان ده‌ڵێین: (اللهم صل على محمد وعلى آل محمد، كما صليت على إبراهيم وعلى آل إبراهيم إنك حميد مجيد، اللهم بارك على محمد وعلى آل محمد كما باركت على إبراهيم وعلى آل إبراهيم إنك حميد مجيد).

**ئازاردەرانی خواو پێغەمبەر بەر لەعنەتی خوا کەوتوون:**

﴿٥٧ إن الذين يؤذون الله ورسوله﴾ بەراستیی ئەوکەسانەی ئازارو ئەزیەتی خواو پەیامبەرەکەی دەدەن، واتە: سەرپێچی لەفەرمانەکانیان دەکەن ﴿لعنهم الله في الدنيا والآخرة﴾ خوا لە دونیا ولە قیامەتدا نەفرینی لێکردوون و لەمیهرەبانی خۆی دووری خستوونەتەوە ﴿وأعد لهم عذابا مهينا﴾ سزایەکی زۆر سووککەری بۆئامادە کردوون ﴿٥٨ والذين يؤذون المؤمنين والمؤمنات بغير ما اكتسبوا﴾ و ئەوانەش کە ئازاری پیاوانی ئیماندار و ژنانی بڕوادار دەدەن بێ هیچ تاوانێك کردبێتیان ﴿فقد احتملوا بهتانا وإثما مبينا﴾ بێگومان ئەوانە درۆو بوختان و گوناحی ئاشکرایان هەڵگرتووە.

**دەبێ ژنان خۆیان بە چارشێو دا پۆشن:**

﴿٥٩ يا أيها النبي قل لأزواجك وبناتك ونساء المؤمنين﴾ ئەی پەیامبەرﷺ! بەژنەکانت، کچەکانت و ژنانی بڕوادار بڵێ: ﴿يدنين عليهن من جلابيبهن﴾ لە باڵاپۆش و عاباکانیان بپێچن بە خۆیانا، بە شێوەیەك کە تەواوی سەرو مل و جەستەیان داپۆشێ.

پێناسەیەك بۆ جیلباب: ئیبنی عەباس دەڵێت: جیلباب: ئەو جل وبەرگەیە تەواوی جەستە هەرلە پێ تا تەوقە سەر داپۆشێ" دەشکرێ بڵێین: ئەو پارچە قوماشەیە کە ژنان بەسەر جل وبەرگەکانیاندا دەیپێچن بەخۆیاندا وەکو عەبا کە ژنانی عێراقیی بەکاری دێنن. بەڵێ ژنان هەرکاتێ لەماڵ چونە دەرێ بۆهەر ئیش وکارێکی پێویست، دەبێ ئەو (جیلباب)ـە بەکار بهێنن وتەواوی سەروملی وگەردن وسنگ وبەرەکیان پێداپۆشن هەتا دەگاتە قولە پێیان، بەکارهێنانی ئەو پارچە حیجابەش کە ئێستا لەناودایە جێی جیلباب دەگرێتەوە بەمەرجێك (میقنەعە)ـی لەگەڵدابێ.﴿ذلك أدنى أن يعرفن فلا يؤذين﴾ ئەو خۆداپۆشینەش لەبارترین شتە " کە ئێوە بە پاك و خاوێنی و داوێن پارێزی بناسرێن و بەر قسەو بوختان نەکەون و ئازارو ئەزیەت نەدرێن ﴿وكان الله غفورا رحيما﴾ هەمیشەو بەردەوام خوا چاوپۆشیکارە "بەرامبەر بەوانەی پێشتر درێغیان هەبووبێت زۆریش میهرەبانە لەگەڵ ئەوانەدا فەرمانەکانی جێبەجێ دەکەن ﴿٦٠ لئن لم ينته المنافقون والذين في قلوبهم مرض والمرجفون في المدينة﴾ سوێند دەخۆم ئەگەر دوو ڕووەکان و ئەوانەی کە دڵیان نەخۆشەو هەروا ئەوانەش کە لەمەدینەدا خۆیان گرتە دواوە دژ بە موسڵمانەکان پڕو پاگەندە بڵاو بکەنەوە ئەگەر کۆڵنەدەن و دەست هەڵنەگرن ﴿لنغرينك بهم﴾ ئەوا ئێمە تۆ هەڵئەنێین کە جەنگیان لەگەڵ بکەیت و دەرەنجامیش زاڵیشت دەکەین بەسەریاندا ﴿ثم لا يجاورونك فيها إلا قليلا﴾ پاشانیش بۆ ماوەیەکی کەم نەبێت نەتوانن لەشاردابمێننەوەو دراوسێتیت بکەن، واتە: تەفروتونا وشار بەدەر دەکرێن ﴿٦١ ملعونين أينما ثقفوا أخذوا﴾ نەفرینیشیان لێکراوە و لەمیهرەبانی خوا دەرکراون لەهەر جێگایەك دەستکەون، دەبێ دەستگیر بکرێن ﴿وقتلوا تقتيلا﴾ و زۆریش بەتوندی بکوژرێن ﴿٦٢ سنة الله في الذين خلوا من قبل﴾ دژایەتی ئەوانەی لەبەرنامەی خودایەو لەنێو ئەوانەشدا کە لەپێش تۆوە ژیاون ئەنجامدراوەو بڕیار دراوە کە هەر دوو ڕوویەك لەگەڵ هەر پەیامبەرێکدا دژایەتی کردبێت ئەوا بڕیاری گرتن و کوشتنی دراوە ﴿ولن تجد لسنة الله تبديلا﴾ هەرگیز تۆ گۆڕانکارییت دەست ناکەوێ لەباوو بڕیارەکانی خوادا.

**هەر خوا دەزانێ قیامەت کەی دێ:**

﴿٦٣ يسألك الناس عن الساعة﴾ بێباوەڕەکان پرسیاری هاتنی ڕۆژی قیامەتت لێئەکەن! ﴿قل إنما علمها عند الله﴾، پێیان بڵێ: ئەی پێغەمبەر! هەر خوا خۆی زانیاریی وئاگاداریی تەواوی هەیە بەڕۆژی قیامەت کە کەی دێت.

هەرئەم ماناومەبەستەیە لەچەند ئایەتێکی تریشدا هاتووە: (٣١/٣٤): (إن الله عنده علم الساعة)، (٦/٥٩): (وعنده مفاتح الغیب)، (٧/١٨٧): (یسألونك عن الساعة)، (٧٩/٤٢/٤٤) (٤١/٤٧): (إلیه یرد علم الساعة..). لەم فەرموودەیەشدا هاتووە: ((ما المسؤول عنها بأعلم من السائل)) متفق علیه. واتە: منی پرسیارلێکراو لەبارەی هاتنی رۆژی قیامەتەوە لەتۆی پرسیارکەر (ئەی جوبریل) بەئاگاتر نیم. ﴿وما یدریك لعل الساعة تكون قریبا﴾ جا تۆ چووزانیت لە قیامەت؟ لەوانەیە کاتی هاتنیشی زۆر نزیك بێت! لەسوورەتی (٤٢/١٧) وما یدید لعل الساعة قریب)، وە لەسوورەتی(٥٤/١): (إقتربت الساعة وانشق القمر..) وە لەسوورەتی (٢١/١): (اقترب للناس حسابهم وهم في غفلة معرضون) هاتووە کە هەموویان بەتێکڕا پشتگیرن بۆ نزیکی هاتنی رۆژی قیامەت. ﴿٦٤ إن الله لعن الكافرین وأعد لهم سعیرا﴾ بەڕاستیی ئەوخوایە نەفرینی لە بێ بڕواکان کردووە ولەرەحمەتی خۆی دووری خستوونەتەوە وئاگرێکی هەڵگیرساوی زۆر سوتێنەریشی بۆ ئامادە کردوون ﴿٦٥ خالدین فیها أبدا﴾ بەهەتاهەتایی دەبێ لەوێدا بمێننەوە﴿لا یجدون ولیا ولا نصیرا﴾ دیارەلەوێش هیچ دۆست و یارمەتیدەرێکیان دەست ناکەوێ ﴿٦٦ یوم تقلب وجوههم فی النار﴾ بەتایبەتی لەرۆژێکا کە دەم وچاویان لەناو ئاگری دۆزەخدا ئەم دیوئەودیوی پێدەکرێت تا چاك ببرژێ. ﴿یقولون یا لیتنا أطعنا الله وأطعنا الرسولا﴾ دەڵێن: بریا بەفەرمانی خوامان کردباو گوێرایەڵی پێغەمبەریش باین ﴿وقالوا ربنا إنا أطعنا سادتنا وكبراءنا﴾ وە ئەڵێن: پەروەردگارا! بێگومان ئێمە فەرمانبەرداری سەرداروئاغاو گەورەکانمان بووین "و بەگوێی ئەوانمان کرد" ﴿فاضلونا السبیلا﴾ئەوانیش رێیان لێ هەڵە کردین و"چەواشەیان کردین" ﴿٦٨ ربنا آتهم ضعفین من العذاب﴾ پەروەردگاری ئێمە! دووهێندە سزایان بدە, واتە: سزای گومڕایی خۆیان سزای گومڕا کردنی ئێمەیان بدە ﴿والعنهم لعنا كبیرا﴾ نەفرینێکی زۆریان لێبکەو لەمیهرەبانی خۆت زۆر زۆر دووریان بخەرەوە.

الجزء الثاني والعشرون — سورة الأحزاب

يَسْـَٔلُكَ ٱلنَّاسُ عَنِ ٱلسَّاعَةِ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ ٱللَّهِ وَمَا يُدْرِيكَ
لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ تَكُونُ قَرِيبًا ﴿٦٣﴾ إِنَّ ٱللَّهَ لَعَنَ ٱلْكَٰفِرِينَ وَأَعَدَّ
لَهُمْ سَعِيرًا ﴿٦٤﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا لَّا يَجِدُونَ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا
﴿٦٥﴾ يَوْمَ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمْ فِى ٱلنَّارِ يَقُولُونَ يَٰلَيْتَنَآ أَطَعْنَا ٱللَّهَ
وَأَطَعْنَا ٱلرَّسُولَا۠ ﴿٦٦﴾ وَقَالُوا۟ رَبَّنَآ إِنَّآ أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا
فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠ ﴿٦٧﴾ رَبَّنَآ ءَاتِهِمْ ضِعْفَيْنِ مِنَ ٱلْعَذَابِ
وَٱلْعَنْهُمْ لَعْنًا كَبِيرًا ﴿٦٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ
ءَاذَوْا۟ مُوسَىٰ فَبَرَّأَهُ ٱللَّهُ مِمَّا قَالُوا۟ وَكَانَ عِندَ ٱللَّهِ وَجِيهًا ﴿٦٩﴾
يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ
لَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ
فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلْأَرْضِ وَٱلْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا
ٱلْإِنسَٰنُ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا ﴿٧٢﴾ لِّيُعَذِّبَ ٱللَّهُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ
وَٱلْمُنَٰفِقَٰتِ وَٱلْمُشْرِكِينَ وَٱلْمُشْرِكَٰتِ وَيَتُوبَ ٱللَّهُ
عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٧٣﴾

٤٢٧

## جوولەکە بۆ مووسا بوختان دەکات:

﴿٦٩ یا أیها الذین آمنوا لا تكونوا كالذین آذوا موسى﴾ ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە،! وەکو ئەوکەسانە مەبن کە ئازاری موسایاندا و تۆمەتیان بۆ هەڵبەست ﴿فبرأه الله مما قالوا﴾ خواش موسای تەبریە کرد لەوبوختانەی بۆیان کرد ﴿وكان عند الله وجیها﴾ چونکە موسا لای خوا, گەورەو خاوەن (جاە)و رێز بوو پێشەوا (بوخاریی) ئەڵێت: ((إن رسول الله ﷺ قال: إن موسى كان رجلا حییا ستیرا، لا یرى من جلده شئ استحیاء منه، فآذاه من آذاه من بني إسرائیل فقالوا: ما یتستر هذا التستر إلا عیب فی جلده إما برص، وإما أدرة – انتفاخ الخصیتین – وإما آفة، وإن الله أراد أن یبرأه مما قالوا لموسى، فخلا یوما وحده فخلع ثیابه على حجر ثم اغتسل، فلما فرغ أقبل إلى ثیابه لیأخذها

وإن الحجر عدا بثوبه، فأخذ موسى عصاه وطلب الحجر، فجعل يقول: ثوبي حجر، ثوبي حجر، حتى إنتهى إلى ملأ من بني إسرائيل فرأوه عريانا أحسن ما خلق الله -عز وجل- و أبراه مما يقولون وقام الحجر، فأخذ ثوبه فلبسه، وطفق بالحجر ضربا بعصاه، فوالله إن بالحجر لندبا - أثرا- من أثر ضربه ثلاثا أو أربعا أو خمسا -قال- فذلك قوله تعالى: (ولا تكونو كالذين آذوا موسى..). پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڕاستیی مووسا پیاوێکی زۆر بەشەرم و خۆداپۆشەر بوو، هەرگیز هیچ شتێکی -لەشەرمدا- نەدەبینرا، جا بەنی ئیسرائیل وتیان: ببیٚ و نەبیٚ" موسا یا توشی نەخۆشی بەڵەکی بووە، یا قۆڕە، یا گرفتێکی تری هەیە! بۆیە ئەوەندە سوورە بۆ خۆ داپۆشین! ئەو جا خوا ویستی پاکانەی بۆ بکات لەو بوختانە، بۆیە ڕۆژیٚ مووسا بەتەنیا لەچۆڵیەکا خۆی دەشۆریٚ و جل وبەرگەکەی لەسەر بەردیٚ دادەنیٚ، جاکاتیٚ لیٚبوویەوەو چووجلەکانی لەبەر بکاتەوە" و ڕۆیشت، مووسایش دار دەستەکەی بەدەستەوە گرت و دوای کەوت وهەر ئەی وت: بەردەکە! جلەکانم. وئەوانیش بەرووت و قووتی دیتیان و بۆیان دەرکەوت کە هیچ عەیب و نەنگیٚکی پێوە نیەیە. بەکورتیی: موسا ﷺ پیاوێکی زۆر بە شەرم بوو، زۆر هەوڵی ئەدا لەشی نەبینریٚ، بۆیە زۆریش خۆی دائەپۆشیٚ، جا لەبەرئەوە جوولەکەکان وتیان: دیارە لەشی عەیبدارە بۆیە ئەوەندە سورە لەسەر خۆ داپۆشین! جا خوای گەورە کارێکی بۆ سازان - ئەوەی فەرموودەکە- و جوولەکە بەچاوی خۆیان دیتیان کە جوانترین و بیٚ عەیب ترین تەن و لەشی هەیە. ﴿ ٧٠ يا أيها الذين آمنوا اتقو الله﴾ ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! هەر لەخوا بترسن ﴿وقولوا قولا سديدا﴾ و قسەی ڕاست و ڕێك وپێك بکەن ﴿ ٧١ يصلح لك أعمالكم﴾ ئەوساخوا کارەکانتان بۆڕاست دێنیٚ و، هیدایەتتان دەکا بۆ ئەنجامدانی کاری چاك ﴿ويغفر لكم ذنوبكم﴾ و گوناهەکانیشتان بۆ دەپۆشیٚ ﴿ومن يطع الله ورسوله فقد فاز فوزا عظيما﴾ و هەرکەسێك گوێرایەڵی فەرمانی خواو پەیامبەری ئەو بکات، ئەوە بێگومان سەرکەوتنێکی گەورەی بە دەست هێناوە.

**مرۆڤ قبوڵی هەلگرتنی سپاردەی کرد:**

﴿ ٧٢ إنا عرضنا الأمانة على السموات والأرض والجبال﴾ بەڕاستیی ئێمە سپاردەو (تەکالیف)ەکانمان خستە سەر ئاسمانەکان و زەویی و کێوەکان ﴿فأبين أن يحملنها﴾ کەچی هیچیان لەخۆیان ڕانەدی و،لەهەڵگرتنیان نکوڵییان کرد. خاوەنی (أضواء البيان) ئەڵێت: ئەم (عەرض)ونماییشی سپاردەیەو، وەرنەگرتنی ئاسمانەکان وزەویی وچیاکان.. شتێکی ڕاستەو حەقیقەتی هەیە، هەرچەند ئێمەش چۆنیەتیەکەی دەرك نەکەین، وە دەشڵیٚ بۆ ئەم ڕاستیە ئایەت وفەرموودە زۆرە، لەوانە: (وإن من الحجارة لما يهبط من خشية الله) (٧٤/٢)، وە (تسبح له السموات السبع والأرض ومن فيهن..) (٤٤/١٧)، وە (وسخرنا مع داود الجبال يسبحن) (٩٧/٢١)، وە فەرموودەیش: وەك گریانی بنکی دارەخورماکە، ئەو کاتە کەپێغەمبەر ﷺ وتاری لەسەر ئەداڵە مەدینەدا، پاشان لەویٚ گواستیەوەو چووە سەر میمبەرەکە، وەك ئیمامی (بوخاریی) هێناویەتی. وە لە (موسلیم)یشدا هاتووە: (عن النبي ﷺ إني لأعرف حجرا كان يسلم علي في مكة..) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڕاستی من بەردیٚ ئەناسم" کاتیٚ کە لەمەککەدا بووم هەمیشە سڵاوی لیٚئەکردم! ئەمەو چەند فەرموودەیەکی تریش.. ﴿واشفقن منها﴾ نەچوونە ژێری و ترسان کە: نەتوانن هەڵسن بەجێبەجێکردنی داخوازییەکان ﴿وحملها الإنسان إنه كان ظلوما جهولا﴾ کەچی مرۆڤ هاتە پێشەوەوچووە ژێرباری وهەڵیگرت! بەڕاستیی ناهەقیی لەخۆکردو نەیزانی بەئەنجام، ئەگینا هەرگیزهەڵی نەئەگرت. واتە: بەجیٚ هێنانی فەرمانەکانی خوا ئەوەندە گرنگە ئاسمان و زەویی وشاخەکان لەگەڵ ئەوهەموو توانایەدا بۆیان هەڵنەگیرا! کەچی ئادەمیی-بەنەزانی خۆی- هەڵیگرت!! ﴿ ٧٣ ليعذب الله المنافقين والمنافقات والمشركين

والمشركات﴾ بۆ ئەوەی لە ئاکامدا – بە هۆی پشتگوێ خستن وسەرپێچی وخیانەت لەو سپاردەیە –خوا سزای پیاوان و ژنانی دووڕوو هاوبەشدانەران بدات ﴿ویتوب الله علی المؤمنین والمؤمنات﴾ و تەوبەش لە پیاوان وژنانی بڕوادار– بە هۆی پاراستنی ئەو سپاردەیەو گوێڕایەڵی وتاعەتەیان– وەربگرێت. ﴿وکان الله غفورا رحیما﴾ دیارە، خوایش هەمیشە لێبوردەیە، دلۆڤان ومیهرەبانە قەڵەمی لێبوردن بەسەرِ گوناهاندا دێنیٚ.سا خوای گوناهپۆش و دلۆڤان! لێمان ببوورەو، ڕەحممان پێبکە. امین.

زۆریش سوپاس بۆ خوای دەسەڵاتدار کە هاوکاریی و پشتیوانی کردم بۆ تەواو کردنی تەفسیری سوورەتی (ئەحزاب).

*** *** ***

## ٣٤- سوورەتی ( سەبەء )ـە
## مەککەییەو ( ٥٤ ) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەمیش وەك هاووێنەکانی خۆی باسی بناغە سەرەکییەکانی دینی ئیسلام: یەکتاپەرستیی، پەیامبەریەتیی، زیندووبوونەوە، پاداشت و تۆڵە ئەکا.. داستانی هەندێ لەپەیامبەرانیش ڕاڤە ئەکات، وەك (داوود) و (سولەیمان)ی کوڕیی، لەبارەی ئەودەسەڵاتەوە خوا پێی بەخشین.. پەنجەیش ئەخاتە سەرشك وبەدگومانی موشریکەکان سەبارەت بەپەیامەکەی پەیامبەرﷺ، کۆتاییشی دێت بەبانگکردنی بێبڕواکان بۆبڕواهێنان ویەکلابوونەوەو دەستبەردان لەبیرو باوەڕو بۆچوونی پووچەڵیان. بۆیەش ناوی (سەبەء)ـە چونکە چیرۆك وبەسەرهاتەکەی پاشاکانی یەمەن دەگێڕێتەوە، بەتایبەتی ئەو هەموو خۆشیی ونیعمەت و خۆشگوزەرانییە خوا پێیدابوون، کەچی ئەوان هەر زۆرناسوپاس و سپڵە بوون، جاخوایش تۆڵەی لێکردنەوەو لێیتێکدان و تارومارى کردن.

جابەم شێوەیەش دەست پێدەکات: ﴿بسم الله الرحمن الرحیم * [1] الحمد الله الذی له مافی السموات ومافی الأرض﴾ گشت سوپاس وستاییشێکی شیاو , تەنها بۆئەوخوایە کەهەرچی لەئاسمانەکان و، لەزەوییدایە هەرهی ئەوە ﴿وله الحمد فی الآخرة﴾ سوپاسی شیاو لە ڕۆژی دواییشدا هەر بۆ ئەوە,نەك کەسێکی تر. ﴿وهو الحکیم الخبیر﴾ هەر ئەویشە هەمیشە کارجوان و کار ڕەنگین, هەرچی ئەکات زۆر جێی خۆیەتی, وە ئەویشە زۆریش ئاگا دەربارەی کاروکردەوەی دروستکراوە کانیی ﴿[2] یعلم ما یلج فی الأرض وما یخرج منها وما ینزل من السماء وما یعرج فیها﴾ هەرچی دەچێتە ناو جەرگەی زەویی، وەك باران وشتی تر وە هەرچیش لێی دێتە دەرێ وەك ئاو وشتی تر, وە هەرچیش لەئاسماندا دێتە خوارێ، وەك فریشتە وباران وبروسکە وشتی تر وە هەرچیش لێیەوە سەرئەکەوێ و بەرز ئەبێتەوە وەك فریشتەو کردەوەی بەندەکان وشتی تر، ئەوخوایە پێی دەزانیٚ وبە ئاگایە ﴿وهو الرحیم الغفور﴾ ئەویشە بۆخۆشی زۆر میهرەبان و! زۆر لێبوردەیە!. جاپاش ململانێی کافرەکان دەربارەی زیندووبوونەوە, خوای لە کارزان لەسێ جێگای قورئاندا فەرمان بە پێغەمبەر دەدا سوێند بە پەروەردگاری دەخوات کە زیندووبوونەوە ڕاستەو پێشدێت.

یەکەم: لە سوورەتی(یونس)دا ئایەتی: (ویستنبئونك أحق هو قل إی و ربی إنه لحق و ما أنتم بمعجزین).

دووەم: لەم سوورەتەدا: (و قال الذین کفروا..).

سێیەم: لە سوورەتی(تغابن)دا: (زعم الذین کفروا أن لن یبعثوا قل بلی و ربی لتبعثن ثم لتنبئن بما عملتم و ذلك علی الله یسیر).

**قیامەت دێت و، هەمو کەسیش بەپێی کاری خۆی پاداشت دەدرێتەوە:**

﴿[3] وقال الذین کفروا لا تأتینا الساعة﴾ و ئەوانەی خوانەناس وبێ بڕوابوون ونکووڵی زیندووبوونەوەیان دەکرد وتیان: هەرگیز ڕۆژی قیامەتمان بۆنایە، واتە: بەهیچ شێوەیەك قیامەت نیە! ﴿قل بلی وربی لتأتینکم عالم الغیب﴾ ئەی پێغەمبەر! بڵێ: بەڵێ سوێندم بەپەروەردگارم هەربۆتان پێش دێت, لە لایەن خوای زانای گشت نادیار ﴿لا یعزب عنه مثقال ذرة فی السموات ولا فی الارض﴾ کە بەئەندازەی تۆزقاڵێك شتی لێ ون نابێ, نە لە ئاسمانەکان ونە لە زەویدا ﴿ولا اصغر من ذلك ولا اکبر﴾ وە نە بچووکتر لەزەرە و، نە گەورەتریش لێی ﴿إلا فی کتاب مبین﴾ مەگەر ئەوە هەموو لەناو نامەیەکی روونکەرەوە (لوح المحفوظ)دا لای پەروەردگار نووسراوەو هەڵگیراوە ﴿[4] لیجزی الذین آمنوا وعملوا الصالحات﴾ تاپاداشی ئەوانە بداتەوە بڕوایان هێناوەو ئاکاری کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە ﴿اولئك لهم مغفرة ورزق کریم﴾ بۆ ئەمانە لە بە هەشتدا لێبوردن و رزق و رۆزی چاك هەیە ﴿[5] والذین سعوا فی آیاتنا معاجزین﴾ ئەوانەش کە هەرچی لەتوانایاندایە بەختی دەکەن بۆ پووچەڵکردنەوەی ئایەتەکانمان بە مەبەستی هەڵهاتنیان لە دەستمان. ﴿اولئك لهم عذاب من رجز الیم﴾ بۆ ئەوانە هەیە سزایەك لە بەدترین جۆری سزای بە ئێش. ﴿[6] ویری الذین اوتوا العلم﴾ و ئەوانەش کە لەزانیاریی بەشدراون لەلایەن خواوە، واتە: لە خاوەن نامەکان و هاوەڵانی پەیامبەر ﷺ سوور ئەزانن ﴿الذی انزل إلیك من ربك هو الحق﴾ ئەوەی کە بۆ تۆ ناردراوە لەلایەن پەروەردگارتەوە هەرئەو راست ودروستە، واتە: ئەو نەفاما نە نکووڵی زیندووبوونەوە ئەکەن، کەچی خاوەن زانستەکان بەراست و دروستی ئەزانن ﴿ویهدی إلی صراط العزیز الحمید﴾ وە بۆ رێی خوای خاوەن دەسەڵات وسوپاسکراو (جن وئادەمزاد) رێنوێن دەکا.


الجزء الثاني والعشرون — سورة سبإ

سورة سبإ — مكية — آياتها ٥٤

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله الذي له ما في السموات وما في الأرض وله الحمد في الآخرة وهو الحكيم الخبير (١) يعلم ما يلج في الأرض وما يخرج منها وما ينزل من السماء وما يعرج فيها وهو الرحيم الغفور (٢) وقال الذين كفروا لا تأتينا الساعة قل بلى وربي لتأتينكم عالم الغيب لا يعزب عنه مثقال ذرة في السموات ولا في الأرض ولا أصغر من ذلك ولا أكبر إلا في كتب مبين (٣) ليجزي الذين ءامنوا وعملوا الصلحت أولئك لهم مغفرة ورزق كريم (٤) والذين سعو في ءايتنا معجزين أولئك لهم عذاب من رجز أليم (٥) ويرى الذين أوتوا العلم الذي أنزل إليك من ربك هو الحق ويهدي إلى صرط العزيز الحميد (٦) وقال الذين كفروا هل ندلكم على رجل ينبئكم إذا مزقتم كل ممزق إنكم لفي خلق جديد (٧)

٤٢٨ — أفترى على

**حاشاکەران لە ژینی دوای مردن دەمکوت دەکرێن:**

﴿[7] وقال الذین کفروا﴾ ئەوانەی بێبڕوا بوون هەندێکیان بە گاڵتە کردن بە زیندووبوونەوە بە هەندێکیانیان وت: ﴿هل ندلکم علی رجل ینبئکم﴾ ئایا دەتانەوێ پیاوێکتان نیشان بدەین هەواڵتان بداتێ؟ (مەبەستیان پەیامبەر بوو ﷺ) ﴿إذا مزقتم کل ممزق﴾ کاتێ ئێوە مردن ولەگۆڕەکانتانا رزین وهەپروون هەپروون کران وبوونەوە گڵ ﴿إنکم لفی خلق جدید﴾ کە ئێوە بۆ جارێکی تر, سەر لە نوێ دروست دەکردنێنەوەو زیندوو دەبنەوە؟ ﴿[8] افتری علی الله کذبا ام به جنة﴾ نازانین ئاخۆ بەدەست ئەنقەست درۆ لە سەر خوا دەکا!" یان شێتە؟ چونکە – بەلای

ئەوانەوە – قسەی وا ئەبێ یەکێ لەو دووکەسە بیکات، ئەگینە پیاوی ژیرو راستگۆ ئەو قسەیە ناکا! ﴿بل الذين لا يؤمنون بالآخرة فى العذاب والضلال البعيد﴾ نەخێر هەرگیز موحەممەد نەدرۆ دەکاو نەشێتە، بەڵکو ئەوانەی وا بڕوایان بە پاشە رۆژ نییە، لەناو سزاو سەرلێشێواوییەکی دوور لە هەق و رێنمایی دان. ﴿[٩] أفلم يروا إلى ما بين ايديهم وما خلفهم من السماء والأرض﴾ ئایا – ئەوانە – سەیرێکی پێشەوەوپاشەوەی خۆیانیان نەکرد, تا ببینن وبزانن خوا چی دروستکردووە لە ئاسمان و زەوییدا؟ بۆئەوەی تواناو دەسەڵاتی ئەو بزانن، وەك لە جێطایەکیتردا ئەفەرموێ: (والسماء بنيناها بأيد وإنا لموسعون، والأرض فرشناها فنعم الماهدون) ٥١/٤٧–٤٨. ﴿إن نشأ نخسف بهم الأرض﴾ ئەگەر بمانەوێ زەویی بەوانیشەوە دەیبەینە خوارێ ﴿او نسقط عليهم كسفا من السماء﴾ یان بمانەوێ چەند پارچە سزایە بخەین بە سەریاندا, دەیخەین بە سەریاندا. ﴿إن في ذلك لآية لكل عبد منيب﴾ بێگومان لەودەسەڵاتەدا بەڵگەیەکی هەرە گەورە هەیە – لەسەر دەسەڵاتی خوا لە سەر زیندووکردنەوە بۆ هەر بەندەیەك بیەوێ بۆ لای خوا بگەڕێتەوە واتە: ئاسمان وزەویی بەوهەموو یاسا قەشەنگەیانەوە دەبنە بەڵگەی زیندوو بوونەوەو هاتنی رۆژی دوایی، چونکە کەسێك بتوانێ ئەوکارە گرنگانە ئەنجامبدا، ئەی چۆن ناتوانێ مردوان زیندووبکاتەوە..؟! لەکاتێکا: (لخلق السموات والأرض أكبر من خلق الناس ولكن أكثر الناس لا يعلمون) دروستکردنی ئاسمانەکان وزەویی مەزنترە لە دروستکردنی مەردم بەڵام زۆرتر خەڵك نازانن.



أَفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَم بِهِۦ جِنَّةٌۢ ۗ بَلِ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ
فِى ٱلْعَذَابِ وَٱلضَّلَـٰلِ ٱلْبَعِيدِ ﴿٨﴾ أَفَلَمْ يَرَوْا۟ إِلَىٰ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ
وَمَا خَلْفَهُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ۚ إِن نَّشَأْ نَخْسِفْ بِهِمُ
ٱلْأَرْضَ أَوْ نُسْقِطْ عَلَيْهِمْ كِسَفًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ
لَـَٔايَةً لِّكُلِّ عَبْدٍ مُّنِيبٍ ﴿٩﴾ ۞ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ مِنَّا فَضْلًا ۖ
يَـٰجِبَالُ أَوِّبِى مَعَهُۥ وَٱلطَّيْرَ ۖ وَأَلَنَّا لَهُ ٱلْحَدِيدَ ﴿١٠﴾ أَنِ ٱعْمَلْ
سَـٰبِغَـٰتٍ وَقَدِّرْ فِى ٱلسَّرْدِ ۖ وَٱعْمَلُوا۟ صَـٰلِحًا ۖ إِنِّى بِمَا تَعْمَلُونَ
بَصِيرٌ ﴿١١﴾ وَلِسُلَيْمَـٰنَ ٱلرِّيحَ غُدُوُّهَا شَهْرٌ وَرَوَاحُهَا شَهْرٌ ۖ
وَأَسَلْنَا لَهُۥ عَيْنَ ٱلْقِطْرِ ۖ وَمِنَ ٱلْجِنِّ مَن يَعْمَلُ بَيْنَ يَدَيْهِ بِإِذْنِ
رَبِّهِۦ ۖ وَمَن يَزِغْ مِنْهُمْ عَنْ أَمْرِنَا نُذِقْهُ مِنْ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١٢﴾
يَعْمَلُونَ لَهُۥ مَا يَشَآءُ مِن مَّحَـٰرِيبَ وَتَمَـٰثِيلَ وَجِفَانٍ كَٱلْجَوَابِ
وَقُدُورٍ رَّاسِيَـٰتٍ ۚ ٱعْمَلُوٓا۟ ءَالَ دَاوُۥدَ شُكْرًا ۚ وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِىَ
ٱلشَّكُورُ ﴿١٣﴾ فَلَمَّا قَضَيْنَا عَلَيْهِ ٱلْمَوْتَ مَا دَلَّهُمْ عَلَىٰ مَوْتِهِۦٓ
إِلَّا دَآبَّةُ ٱلْأَرْضِ تَأْكُلُ مِنسَأَتَهُۥ ۖ فَلَمَّا خَرَّ تَبَيَّنَتِ ٱلْجِنُّ
أَن لَّوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ٱلْغَيْبَ مَا لَبِثُوا۟ فِى ٱلْعَذَابِ ٱلْمُهِينِ ﴿١٤﴾

ثلاثة أرباع الحزب ٤٣



### خوا زێدە بەشێکی بە داوود دا:

﴿[١٠] ولقد آتينا داود منافضلا﴾ سوێند بە خوا ئێمە لە فەزڵ و بەهرەی خۆمان نیعمەتێکی فراوانمان بە (داود) دا, واتە: کردمانە پەیامبەرو زەبوورمان دایە ﴿يا جبال أو بى معه والطير﴾ بەکێوەکانیشمان گوت:! ئێوەش لەگەڵ داوددا یەك دەنگبن و گشت پێکەوە تەسبیحات بکەن ,واتە: ئەو کە تەسبیحاتی خوای کرد, هەروا ئێوەش ئەی پەلەورەکان! لەگەڵیابن, وەك ئەفەرموێ: (إنا سخرنا الجبال معه يسبحن بالعشى والأشراق)١٨/٣٨. ﴿وألنا له الحديد﴾ و ئاسنیشمان بۆ نەرمکرد، بەئارەزووی خۆی چۆنی ویستبا کاری پێی ئەکرد, بێ ئەوە بیخاتە ناو کوورەی ئاگرەوە ﴿[١١] أن اعمل سابغات وقدر فى السرد﴾ پێمانگووت: کە هەموو جۆرە زرێیەکی بالاپۆش و, تاس کلاوێك (بە ئاڵقە چنراو) و ئەندازەگیر, دروست بکە بۆ کاتی جەنگ و خۆپاراستن لە جەنگ، وایشبن کە هیچ تیرێك نەیانشکێنێ وکونیان تێنەکات ﴿واعملوا صالحا﴾ پێشمانگوتن: کاری چاك بکەن, واتە: دەبێ هەموو کارەکانتان چاك بن گوێرایەڵی خوا بن، لەبەرامبەر ئەو هەموو چاکەیەوە ﴿إنى بما تعملون بصير﴾ بەراستیی من بە کاری ئێوە بینام وچاودێرتانم. بەڵێ خوا بەش وبەهرەیەکی زۆری بەخشی بە داود– عليه الصلاة والسلام –: پێغەمبەرایێتی

وتوانا ودەسەڵات وپاشایەتیی و، سوپایەکی زۆرو پرچەك و، دەنگ وئاوازێکی خۆش وسازگار، کە هەموو کات چیاسەربەرزەکان لەگەڵیا (سبحان الله) یان دەگوتەوەو، باڵندەکانیش لەئاسماندا رادەوەستان وگوێیان بۆدەگرت!. لە (فتح الباری/ کتاب فضائل القرآن ٩/ ٩٢،ولە موسلیم/ کتاب صلاة المسافرین ١/ ٥٤٦) هەردووده‌ڵێن: شەوێك پێغەمبەر ﷺ گوێی لەدەنگە خۆشەکەی (ئەبوو موسای ئەشعەری) یەوە بوو، وەستاو گوێی بۆگرت وفەرمووی: (لقد أوتی مزمارا من مزامیر آل داود) بە راستیی دەنگ وئاوازێکی لە دەنگ وئاوازەکەی خانەوادەی داود پێدراوە.

**بەش و بارەتی سولەیمان:**

ئینجا نۆبەی ژماردنی بەهرەکانیەتی بەسەر سولەیمانی کوڕی داودەوە، -علیه السلام- وئەفەرمووێ: ﴿[١٢] ولسلیمان الریح غدوها شهر ورواحها شهر﴾ بۆ سولەیمانیش (با)مان رامکرد، تەنیا لەتاقی بەیانیاندا مانگە ڕێیەکی دەبڕی و، ئێوارانیش ڕێی یەك مانگ دەڕۆیی.(شێخ حەسەنی بەصریی) ئەڵێت: سولەیمان لە(دیمەشق) لەسەر تەختەکەی دائەنیشت و، نانی بەیانی ئەخوارد, ئەوجا هەڵئەفڕی و، بۆ نیوەڕۆش لە (إصطخر) نانی ئەخوارد, لەکاتێکا نێوان هەردووکیان مرۆڤی تیژڕەو بەیەك مانگ ئەوجا ئەیبڕی ﴿وأسلنا له عین القطر﴾ وە بۆ سولەیمان کانییەکی (مس)یشمان تاواندبووەوە هەرچۆنێ ئاسنمان بۆ داود نەرمکرد، بەشێوەیەك وەك سەرچاوەی ئاو ئەڕۆیشت و زۆر بەئاسانی هەموو شتێکی لێ دروست ئەکرد ﴿ومن الجن من یعمل بین یدیه بإذن ربه﴾ و لە جنۆکەش هەبوون بەفەرمانی خوا لەبەردەستییدا کاریان ئەکرد ﴿ومن یزغ منهم عن أمرنا﴾ وە هەر کەسێکیشیان لەفەرمانی ئێمە لای بدا دەرچێ، واتە:بەگوێی ئێمەی نەکا ﴿نذقه من عذاب السعیر﴾ سزای ئاگری سوتێنەری پێ دەچێژین ﴿[١٣] یعملون له مایشاء من محاریب﴾ سولەیمان چیدەویست لەکۆشکی بەرزو قایم ﴿وتماثیل﴾ و جۆراو جۆری کۆتەڵ و پەیکەربۆیان دەکرد , دیارە لەبەرنامەو شەریعەتی (داود)دا ئەو پەیکەرو کۆتەڵانە یاساغ نەبووە، وەك لە شەریعەتی ئیسلامدا حەرام و یاساغە ﴿وجفان کالجواب﴾ وە هەروا قاپ و دەفری زل و گەورە, وەك حەوز کە لەشکرەکەی خۆراکی تیا ئەخوارد ﴿وقدور راسیات﴾ و چەندین تیانەو مەنجەڵی گەورەی دابەسراوو نەجوڵاویان بۆ ئامادە ئەکرد ﴿إعملوا آل داود شکرا﴾ وتمان: ئەی بنەماڵەی داود! سوپاسگوزاری بکەن لەبەرامبەر ئەو هەموو بەهرانەدا رشتوومە بەسەرتاندا ﴿وقلیل من عبادی الشکور﴾ بەڵام لەبەندەکانم کەمێکیان سوپاسگوزارن, واتە: دە ئێوە وامەبن.

**جنۆکە غەیب نازانێ:**

﴿[١٤] فلما قضینا علیه الموت﴾ ئینجا پاش ئەو هەمووده‌سەڵاتە کاتێ بڕیاری مردنمان بۆ داومرانمان ﴿ما دلهم علی موته إلا دابة الأرض تأکل منسأته﴾ هیچ شتێك جنۆکەی ئاگادار نەکرد بەمردنی (سولەیمان) مۆرانە نەبێت کە داردەستەکەی دەخوارد ﴿فلما خر تبینت الجن أن لو کانوا یعلمون الغیب﴾ ئینجا پاش یەکساڵ کاتێ سولەیمان رەتی بردو کەوت، ئەوکات ئاشکرابووو دەرکەوت بۆ ئادەمیی کە ئەگەر جنۆکە شتی نادیاریان زانیبا وەك پڕو پاگەندە وابوو ﴿مالبثوا فی العذاب المهین﴾ ئەوەندە لەو سزا قورس و پەست و کاریگەرەیەدا نەئەمانەوە! (ئیبن عەبباس) ئەڵێ: پاش ساڵێك ئەوجا پێیان زانی کۆچی دوایی کردووە.

**جێگاو شوێنی خەڵکی سەبا:**

﴿[١٥] لقد کان لسبأ فی مسکنهم آیة﴾ سوێند بەخوا جێگاو شوێنی گەلی (سەبا) لە (یەمەن)دا بەڵگەیەکی‌مەزن بوو لەسەر دەسەڵات و توانایی خوا, بۆ پاداشتدانەوەی چاککاران و، تۆڵە دانی خراپکاران، چونکە ئەو گەلە کاتێ

سپڵەیی وخیانەتیان سەبارەت بە نیعمەتەکانی خوا کرد، خوایش پەڕاگەندەی کردن و ریشەی دەرهێنان ﴿جنتان عن یمین وشمال﴾ ئەو بەڵگەیەش دوور باخی گەورە و زۆر قەشەنگ بوون، یەك لەلای راست و، ئەوی دی لای چەپەوە پێمان بەخشیبوون، ئەبێ چەندە دیمەنێکی جوان و سەر سوڕهێنەری بووبێ, بەوشێوە خوا باسیان دەکات!. (ئیبن کەسیر) ئەڵێ: ژنان زەمبیلەیان ئەنا بەسەریانەوە و بەبن درەختەکانیا دەچوون, بێ ئەوە هیچ ئەزیەتێ ببینن میوەکە خۆی دەوەری و زەمبیلەکەی لێ پڕ ئەبوو، جێی باسە, شارەکەشیان کەوتبووە نێوان باخەکانەوە ﴿کلوا من رزق ربکم﴾ وتمان: دەلە ڕسق و رۆزیی پەروەردگارتان بخۆن ﴿واشکروا له﴾ و سوپاسیشی بکەن "لەبەرابەر ئەو هەموو نیعمەت وخۆشیەوە پێی بەخشیوون ﴿بلدة طیبة ورب غفور﴾ شارەکەتان شارێکی خۆش و پاك و خاوێن و، فێنك و سازگارە! وخواشتان پەروەردگارێکی خەتا پۆش و لێبوردەیە ,بۆ هەرکەسێك پێ بزانێ و سوپاسی بکات ﴿[١٦] فأعرضوا﴾ کەچی روویان لەفەرمانی خوا وەرگێڕا ﴿فأرسلنا علیهم سیل العرم﴾ ئەوجار ئێمەش لافاویی بەندیی وێرانکەرمان ناردایە سەریان (دەرگای ئاسمانمان لێکردنەوەو بووبە لێزمە، ئینجا بەستەکەیانی- سد مأرب- وێرانکردوو، ئەوسا دونیای لێ پڕکردنە ئاوو ژیانیان لێ تێکچوو.

الجزء الثاني والعشرون — سورة سبأ

لَقَدْ كَانَ لِسَبَإٍ فِي مَسْكَنِهِمْ ءَايَةٌ جَنَّتَانِ عَن يَمِينٍ وَشِمَالٍ
كُلُوا۟ مِن رِّزْقِ رَبِّكُمْ وَٱشْكُرُوا۟ لَهُۥ بَلْدَةٌ طَيِّبَةٌ وَرَبٌّ غَفُورٌ
﴿١٥﴾ فَأَعْرَضُوا۟ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ سَيْلَ ٱلْعَرِمِ وَبَدَّلْنَٰهُم بِجَنَّتَيْهِمْ
جَنَّتَيْنِ ذَوَاتَىْ أُكُلٍ خَمْطٍ وَأَثْلٍ وَشَىْءٍ مِّن سِدْرٍ قَلِيلٍ
﴿١٦﴾ ذَٰلِكَ جَزَيْنَٰهُم بِمَا كَفَرُوا۟ وَهَلْ نُجَٰزِىٓ إِلَّا ٱلْكَفُورَ ﴿١٧﴾
وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ ٱلْقُرَى ٱلَّتِى بَٰرَكْنَا فِيهَا قُرًى ظَٰهِرَةً
وَقَدَّرْنَا فِيهَا ٱلسَّيْرَ سِيرُوا۟ فِيهَا لَيَالِىَ وَأَيَّامًا ءَامِنِينَ ﴿١٨﴾
فَقَالُوا۟ رَبَّنَا بَٰعِدْ بَيْنَ أَسْفَارِنَا وَظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ فَجَعَلْنَٰهُمْ
أَحَادِيثَ وَمَزَّقْنَٰهُمْ كُلَّ مُمَزَّقٍ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ
شَكُورٍ ﴿١٩﴾ وَلَقَدْ صَدَّقَ عَلَيْهِمْ إِبْلِيسُ ظَنَّهُۥ فَٱتَّبَعُوهُ إِلَّا
فَرِيقًا مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢٠﴾ وَمَا كَانَ لَهُۥ عَلَيْهِم مِّن سُلْطَٰنٍ
إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يُؤْمِنُ بِٱلْءَاخِرَةِ مِمَّنْ هُوَ مِنْهَا فِى شَكٍّ وَرَبُّكَ
عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ حَفِيظٌ ﴿٢١﴾ قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِ
ٱللَّهِ لَا يَمْلِكُونَ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى
ٱلْأَرْضِ وَمَا لَهُمْ فِيهِمَا مِن شِرْكٍ وَمَا لَهُۥ مِنْهُم مِّن ظَهِيرٍ ﴿٢٢﴾

وَلَا تَنفَعُ ٤٣٠

سەبارەت بە (سد العرم — سەدی مەئرەب): (هەمەدانی) ئەڵێت: لەبەشی باشووری خۆرئاوای (مەئرەب)ەوە" زنجیرە شاخێکی تێدایە، بەرەو باکووری خۆرهەڵات درێژ ئەبنەوەو" لەنێوان ئەو شاخانەدا شیوو دۆڵێکی زۆر گەورە و فراوان هەیە.. هەرکات باران باریبا سێڵاوو لافاوێکی زۆری ئەو ناوچەیە لەوێ خڕ دەبوویەوە و دەڕژایە شیوی (آدنة)وە کە نزیکەی (١١٠٠) مەتر بەسەر دەریادا سەر ئەکەوت، جا ئەو ئاوە کە بەرەو باکووری خۆرهەڵات ئەڕۆیشت ماوەی سێ کاتژمێرێکی ئەما بۆ (مأرب)، ئینجا لەوێ تەنگە بەرییەك دەست پێ ئەکات، نێوان شارەکەیش و تەنگە بەریەکە دەشتێکی شاخاوی (٣٠٠) میلی دو,جا ئەگرێتەوە، لەدواییشدا لەساڵی (١٨٤٣) زەوی ناسەکان ئەو سەدەیان دۆزییەوەو سەلماندیان کە رووداوێکی, ئاوا هەبووە.

﴿وبدلناهم بجنتیهم جنتین ذواتی اکل خمط واثل وشئ من سدر قلیل﴾ لە جێی دووباخەپڕمیوە خۆشەکە, دوو باخی دڕکاوی بەروو بووم تاڵ, مازوو و میوەی داری سیواك و درەختی تەرفای بێ کەڵك، کەمێ داری نەبەگمان بۆ هێشتن کە هیچیان کەڵکیان نەبوو ﴿[١٧] ذلك جزیناهم بما کفروا﴾ بەوشێوەیە پاداشمان دانەوە, چونکە ناشوکرو سپڵەو پێنەزان بوون ﴿وهل نجازی إلا الکفور﴾ ئایا ئێمەش تەنها لە سپڵەو نکوڵیکار تۆڵە ئەسێنین , واته:تۆڵەمان تەنیابۆ ستەوکارانە ﴿[١٨] وجعلنا بینهم وبین القری التی بارکنا فیها قری ظاهرة﴾ وە لەنێوان رێگای ئەوان و، نێوان گوندەکانی شام — کە فەڕو پیتمان تێخستبوون- چەند شارو گوندێکی ترمان لەپاڵ یەکتردا ئاوەدان کرد. واته:

ولاتەکەیانمان ئاوەدان و پڕبەرەکەت و، پڕلە خەڵك دروستکردبوو، هەرگیز هەستت بەچۆڵی نەدەکرد ﴿وقدرنا فیها السیر﴾ مەودای نێوان شارو گوندەکانیانمان بەئەندازە دانا، ئەم گوند نزیك بە ئەو گوند، بەزوویی مەردمەکەی ئەگەیشتنە ئاوەدانیی و، خواردنیان دەست دەکەوت ﴿سیروا فیها لیالی وأیاما آمنین﴾ وپێمان وتن: دە بەناویاندا بەشەوان و رۆژان ,بەهێمنیی و، ئاسوودەیی و، بێ ترس لەدوژمن و برسیەتی و تینوویەتی بڕۆن و بگەڕێن ﴿[١٩] فقالوا ربنا باعد بین أسفارنا﴾ کەچی لەباتی سوپاسگوزاری ئەو هەموو خۆشیی و نیعمەتانەدا, وتیان: پەروەردگارمان! ماوەی نێوانی شارەکانمان –لەسەفەردا– بۆ دوورتر کە "تا بەچۆڵ و بیاباندا بڕۆین و توێشوو بۆ سەفەرەکانمان هەڵگرین و سوودی بازرگانیی وەر گرین و، هەژارەکان بخەینە ژێر کار ﴿وظلموا أنفسهم﴾ وە بەو کارە ستەمیان لەخۆیان کرد ﴿فجعلناهم أحادیث﴾ ئینجا ئێمەیش کردماننە سەرگوزەشتەو دەنگوباس وهەواڵ لەناوچەکەدا "بۆیەکتریان ئەگێڕایەوە" ﴿ومزقناهم کل ممزق﴾ و بەتوندی تەفرو تونامان کردن و لەیەکترمان دابڕین، هەر هۆزەیان کەوتە ناوچەو ولاتێکەوە"، بۆیە عەرەب دەڵێ: یاخوا وەك (سەبا)و نازو نیعمەتەکەی ئەوانتان لێ بقەومێ، چونکە ئەوان پاش ئەو هەموو وێرانکاریەیان دەستەیەکیان ئاوارەی (عومان) بوون و، هەر دەستەیەکیان کەوتنە بن دارێکی ولاتی شامەوە، (ئەنصار)یشیان چوونە مەدینە، (خزاعە)یش گەیشتنە (تیهامە).. وە هەروەها... (ئیبنی جەریر). ﴿إن فی ذلك لآیات لکل صبار شکور﴾ بەڕاستیی لەوداستانەی (سەبا)یە گەلێ بەڵگەو نیشانە هەن لەسەر دەسەلات و توانایی خوا, بۆ هەر بەندەیەکی خۆڕاگرو سوپاسگوزار. مەبەست بەم چیرۆکەی (سەبا)یە ئەوەیە کە خەڵکانی دیکەش هۆشیار بن، سپڵە نەبن، ئەگینا بەلاکەی (سەبا)یان لێ دووبارە ئەبێتەوە.

**شەیتان دیتی: شوێنەکەوتووی وەراست گەڕا:**

﴿[٢٠] ولقد صدق علیهم إبلیس ظنه﴾ و بێگومان گومانەکەی شەیتانیش بەرامبەر بەخوا نەناسان وەڕاست گەڕا ,چونکە وادانابوو گومڕایان بکات، وەك لەجێگایەکدا دەفەرموێ: (..ولأغوینهم أجمعین)١٥/ ٣٩. کەچی توانیی‌و سەرکەوت! ﴿فاتبعوه إلا فریقا من المؤمنین﴾ جا ئیتر دەستەیە لەبڕوادارەکان نەبێ" هەموو پەیڕەوییان لێکرد ﴿[٢١] وماکان له علیهم من سلطان﴾ وە شەتیان هیچ دەسەلاتێکی بەسەریاندا نەبوو ﴿إلا لنعلم من یؤمن بالآخرة ممن هو منها فی شك﴾ بەلام تاقییان دەکەینەوە بەشەیتان , بۆ ئەوە کە بزانین و دەرکەوێ چ کەسێ بڕوای بە رۆژی دوایی هەیەو، چ کەسێکیش لێی‌دوودڵەو لەگوماندایە ﴿وربك علی کل شئ حفیظ﴾ و پەروەردگاری تۆ لەسەر هەموو شتێك پارێزەروو چاودێرەو,بەنیازو نیەتیان ئەزانێ ﴿[٢٢] قل ادعوا الذین زعمتم من دون الله﴾ – ئەی موحەممەدﷺ– پێیان بڵێ: ئەوانەی وا پێتان وابوو کە خوان و ئەتانپەرستن –جگە لەخوا– دەئێستا داوایان لێ بکەن با خێروخۆشیتان بۆ فەراهەم بێنن و، بەلاو نەهامەتتان لێ دووربخەنەوە ﴿لا یملکون مثقال ذرة فی السموات ولا فی الأرض﴾ خۆ ئاشکراشە کە بە ئەندازەی مێروولەو وردیلەیەك" یا پرووشێك دەسەلاتیان نییە" نە لەئاسمانەکان و، نە لەزەوییدا، تا هاوکاریتان بکەن ﴿ومالهم فیهما من شرك﴾ وە لەدروستکردنی ئاسمانەکان و زەویشدا هاوبەشی خوا نەبوون ﴿وماله منهم من ظهیر﴾ پاڵپشتی خوا نەبوون و یارمەتیشیان نەداوە. ﴿[٢٣] ولا تنفع الشفاعة عنده إلا لمن أذن له﴾ و تکاکردن لە لای خوا – لەو رۆژی نارەحەتیی و، ترس و لەرزەدا – سودی نابێ، نە بۆ پەرەسراوەکان و، نە بۆ پەرستیارەکانیان، چونکە لەناو دڵە راوکێ و بێزاریدا بوون، ئێستاش حەپەساو و چاوەڕوانن تا بزانن خوا مۆڵەتی کێ ئەدا بۆ تکاکردن وکێش تکا بکات؟ جا ئەوحاڵەتە دژوارە هەروا ئەمینێتەوە وتکاکار نابێ، مەر بۆ کەسێ خوا مۆڵەتی بدا ﴿حتی إذا فزع عن قلوبهم﴾ تا ئەودەمەی کە سام وترس لە دڵیاندا دادەمرکێ بەمۆڵەتدان بە

شەفاعەت بۆیان ﴿قالوا ماذا قال ربكم﴾ ئەوجا دەمیان ئەكرێتەوەو لەناو یەكتردا ئەڵێن: ئاخۆ پەروەردگاری ئێوە چ بڕیارێكی دا، چی وت سەبارەت بە تكاكردن؟؟ ﴿قالوا الحق﴾ لەوەلامدا ئەڵێن: خوا هەق و راستیتی فەرموو, واتە: ئیزنی شەفاعەتی دا بۆ كەسێك خۆی لێی زاریی بێت ﴿وهو العلی الكبیر﴾ هەر ئەویشە زۆر بڵندو پایە بەرزی گەورە, هیچ كەسێك بۆی نیە دەست بخاتە كاریەوە.

**ئەوەی پێی بڵێت شەریك ,بۆ خوا نیە :**

﴿[٢٤] قل من یرزقكم من السموات والأرض﴾ بە بتپەرستەكان بڵێ: ئەی كێ لەئاسمانانندا ڕسق و رۆزی بە ئێوە ئەدات "بە هۆی بارانەوە" وە لە زەو ییەوە بە هۆی رووەك و دانەویڵەوە؟ ﴿قل الله﴾ بڵێ: هەرخوای تاك وتەنیای بی هاوبەش ﴿وإنا أو إیاكم لعلی هدی أو فی ضلال مبین﴾

ئەوسا پێیان بڵێ: دڵنیابن ئێمەی موسڵمانی یەكتاپەرست و، ئێوەی بت پەرست و هاوەڵدانەر، یەكێكمان لەسەر هیدایەت و رێی راستین، یاخود بە ئاشكرا لە نێو گومراییدا رۆچووین؟ ئای ئەمە چ وتەیەكی شیرینە، چ ئوسلوبێكی بەرزە، ئەوخۆی چاك ئەزانێ كە كێ گومرایە، كەچی پێی ناڵێت تۆ گومرایت و، من راستم، تا بەرامبەرەكەی زووهەڵنەیەت و گوێش بۆ ئامۆژگارییەكانی بگرێ ﴿[٢٥] قل لا تسألون عما أجرمنا ولا نسأل عما تعملون﴾ پێیان بڵێ: ئێوە بەرپرسیار نابن لە هەر تاوانێك ئێمە بیكەین، وە هەر وا ئێمەش لە بەرامبەر كردەوەكانی ئێوەوە بەرپرسیار نابین "چاك بێت، یان خراپ، دیارە دیسان ئەمەیش هەر زیادە لوتف و نەرم و نیانییە, بەرامبەر مرۆڤی خراپ دەكرێت، تالە دەمی وتوو وێژدا هەڵنەیەت ﴿قل یجمع بیننا ربنا ثم یفتح بیننا بالحق﴾ بڵێ: لێرە هەر جۆر ئەبێ با ببێ، رۆژێ دێت پەروەردگارمان هەموومان كۆ ئەكاتەوە، لەپاشان بەڕاستیی و دادپەروەرانە دادگاییمان دەكات ﴿وهو الفتاح العلیم﴾ هەر ئەویشە لەو رۆژەدا بڕیار بەدەست و زانا,بە كردەوەی بەندەكانی خۆی ﴿[٢٧] قل أرونی الذین ألحقتم به شركاء﴾ پێیان بڵێ: ئادەی ئەوانەم نیشان بدەن كە ئێوە كردبووتانن بە هاوبەشی خوا، تا بزانم شیاوی ئەوەن؟ ﴿كلا بل هو الله العزیز الحكیم﴾ نەخێر، وانیە ئەوان ئەیزانن، بەڵكو هەر خوا خۆی دەسەڵاتدارو، زۆر كارجوانە.

الجزء الثاني والعشرون — سورة سبإ

وَلَا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ عِندَهُۥٓ إِلَّا لِمَنْ أَذِنَ لَهُۥ ۚ حَتَّىٰٓ إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمْ قَالُوا۟ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ ۖ قَالُوا۟ ٱلْحَقَّ ۖ وَهُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْكَبِيرُ ﴿٢٣﴾ ۞ قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ قُلِ ٱللَّهُ ۖ وَإِنَّآ أَوْ إِيَّاكُمْ لَعَلَىٰ هُدًى أَوْ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٢٤﴾ قُل لَّا تُسْـَٔلُونَ عَمَّآ أَجْرَمْنَا وَلَا نُسْـَٔلُ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٢٥﴾ قُلْ يَجْمَعُ بَيْنَنَا رَبُّنَا ثُمَّ يَفْتَحُ بَيْنَنَا بِٱلْحَقِّ وَهُوَ ٱلْفَتَّاحُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٢٦﴾ قُلْ أَرُونِىَ ٱلَّذِينَ أَلْحَقْتُم بِهِۦ شُرَكَآءَ ۖ كَلَّا ۚ بَلْ هُوَ ٱللَّهُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢٧﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٨﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٢٩﴾ قُل لَّكُم مِّيعَادُ يَوْمٍ لَّا تَسْتَـْٔخِرُونَ عَنْهُ سَاعَةً وَلَا تَسْتَقْدِمُونَ ﴿٣٠﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَن نُّؤْمِنَ بِهَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ وَلَا بِٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ ۗ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ مَوْقُوفُونَ عِندَ رَبِّهِمْ يَرْجِعُ بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ ٱلْقَوْلَ يَقُولُ ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ لَوْلَآ أَنتُمْ لَكُنَّا مُؤْمِنِينَ ﴿٣١﴾

الحزب ٤٤

٤٣١

**خوا پێغەمبەری بۆ هەموو خەڵك ناردووە:**

﴿[٢٨] وما أرسلناك إلا كافة للناس بشیرا ونذیرا﴾ ئێمە هەر بۆیە تۆمان نارد ئەی موحەممەد! ﷺ كە بۆ تەواوی خەڵكانی جیهان, ببیتە موژدەدەرو ترسێنەر. ﴿ولكن اكثر الناس لا یعلمون﴾ بەلام زۆربەی مەردم نازانن ﴿[٢٩] ویقولون متی هذا الوعد إن كنتم صادقین﴾ و هاوبەشدانەرەكان ئەڵێن: باشە! ئەگەر ئێوە راست ئەكەن كە بەڵێنمان پێ دەدەن بە سزای قیامەت , دە ئەم بەڵێنە كەی ئەبێت؟ ﴿[٣٠] قل لكم میعاد یوم﴾ پێیان بڵێ: رۆژێ كە بڕیارە

بەیەکتر بگەن ﴿لا تستأخرون عنه ساعة ولا تستقدمون﴾ نە تاوێك لێی دوا دەکەون و، نە تاوێکیش لێی پێش دەکەون.

**دەسەلأتدارو و بێ دەسەلأتەکانی دنیا دەکەونە ئاخاقتن:**

﴿[٣١] وقال الذين كفروا﴾ خوا نەناس و بێ بڕواکان وتیان ﴿لن نؤمن بهذا القرآن ولا بالذى بين يديه﴾ ئێمە هەرگیز باوەڕ نە بەم قورئانە دەکەین و نە بەو کتێبانەش کە لەپێش ئەوەوە بوون ﴿ولو ترى إذ الظالمون موقوفون عند ربهم﴾ و ئەگەر ببینی ئەی موحەممەد!ﷺ کاتێ ستەمکارەکان لە لای پەروەردگاریاندا "بۆ حیساب و کیتاب" راگیراون و وەستێنراون ﴿يرجع بعضهم إلى بعض القول﴾ و قسە دەڵێن بەیەکترو، یەکتر تاوانبار دەکەن..واتە: ئەو ئەو رۆژەت ئەبینی, بێگومانە رووداوێکی زۆر گەورەت دەدیت ﴿يقول الذين استضعفوا للذين استكبروا﴾ ئەوانەی کزو چەوساوەبوون، بەخۆ بەزل زانەکان ئەڵێن: ﴿لولا انتم لكنا مؤمنين﴾ ئەگەر ئێوە نەبوونایە" بەڕاستیی ئێمە بڕوادار ئەبووین، واتە: هەر ئێوە بوون چەواشەو سەرگەردانتان کردین" ﴿[٣٢] قال الذين استكبروا للذين استضعفوا﴾ ئەوجا خۆ بەزلزان و زۆردارەکانیش بەچەوسێنراوەکان دەڵێن: ﴿أنحن صددناكم عن الهدى بعد إذ جاءكم﴾ ئایا ئێمە بووین, ڕێمان لێگرتن و نەمانهێشت , بەرێی ڕاستدا بڕۆن دوای ئەوکاتەی قورئان هاتە لاتان؟! " نەخێر، وا نییە وەك ئێوە ئەیڵێن: ﴿بل كنتم مجرمين﴾ بەڵکو ئێوە هەر خۆتان گوناهبارو تاوانکار بوون ﴿[٣٣] وقال الذين استعضفوا للذين استكبروا﴾ وە کزکراوو چەوسێنراوەکان, بەخۆ بەزلزانەکان و زۆردارەکان دەڵێن: ﴿بل مكر الليل والنهار﴾ نەخێر، وانیە، بەڵکو ئەرت وفێڵی شەوانە رۆژەی ئێوە بوو ئێمەشی سەرگەردان کرد ﴿إذ تأمروننا﴾ چونکە هەردەم فەرمانتان پێ ئەکردین ﴿ان نكفر بالله ونجعل له أندادا﴾ کە بڕوامان بە خوا نەبێ و" چەند هاوبەشێکی بۆ دابنێین! ﴿واسروا الندامة لما رأوا العذاب﴾ وە پەشیمانی لەدڵیاندا ئەشارنەوە , کاتێ سزاکە دەبینن ﴿وجعلنا الأغلال فى اعناق الذين كفروا﴾ وەکۆت و زنجیر ئەکەینە ملی ئەوانە کافربوون بۆ زیادە سزا ﴿هل يجزون إلا ماكانوا يعملون﴾ ئەوە مافی خۆیانە، ئایامەگەر هەرکەس هەر بەپێی کردەوەی خۆی سزا نادرێ؟ واتە ستەم لەهیچ کەس ناکرێ.

الجزء الثاني والعشرون — سورة سبأ

قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوٓا۟ أَنَحْنُ صَدَدْنَٰكُمْ عَنِ ٱلْهُدَىٰ بَعْدَ إِذْ جَآءَكُم ۖ بَلْ كُنتُم مُّجْرِمِينَ ﴿٣٢﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ بَلْ مَكْرُ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ إِذْ تَأْمُرُونَنَآ أَن نَّكْفُرَ بِٱللَّهِ وَنَجْعَلَ لَهُۥٓ أَندَادًا ۚ وَأَسَرُّوا۟ ٱلنَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ وَجَعَلْنَا ٱلْأَغْلَٰلَ فِىٓ أَعْنَاقِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ هَلْ يُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٣٣﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَا فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَآ إِنَّا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٣٤﴾ وَقَالُوا۟ نَحْنُ أَكْثَرُ أَمْوَٰلًا وَأَوْلَٰدًا وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴿٣٥﴾ قُلْ إِنَّ رَبِّى يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٦﴾ وَمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُكُم بِٱلَّتِى تُقَرِّبُكُمْ عِندَنَا زُلْفَىٰٓ إِلَّا مَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ جَزَآءُ ٱلضِّعْفِ بِمَا عَمِلُوا۟ وَهُمْ فِى ٱلْغُرُفَٰتِ ءَامِنُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱلَّذِينَ يَسْعَوْنَ فِىٓ ءَايَٰتِنَا مُعَٰجِزِينَ أُو۟لَٰٓئِكَ فِى ٱلْعَذَابِ مُحْضَرُونَ ﴿٣٨﴾ قُلْ إِنَّ رَبِّى يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَيَقْدِرُ لَهُۥ ۚ وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن شَىْءٍ فَهُوَ يُخْلِفُهُۥ ۖ وَهُوَ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿٣٩﴾

ويوم يحشرهم — ٤٣٢

**خۆشگوزەرانەکانن رووبەرووی پێغەمبەران دەوەستن:**

﴿[٣٤] ومارسلنا فى قرية من نذير﴾ هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردووە لەشارێکدا بیانترسێنێ ﴿إلا قال مترفوها﴾ مەگەر خۆشگوزەرانەکانیان دەیانوت: ﴿إنا بماأرسلتم به كافرون﴾ بێگومان ئێمە بەوەی پێی نێرراون باوەڕ ناکەین و پەیامەکەتان بەدرۆ دەزانین ﴿[٣٥] وقالوا نحن اكثر اموالا وأولادا﴾ وە دەیانوت: ئێمە لە ئێوە سامان و منداڵی

زۆرترمان هه‌یه! ﴿وما نحن بمعذبین﴾ و هه‌رگیزیش ئێمه سزا نادرێین ئه‌ر قیامه‌ت هه‌بێ و راست بێ، چونکه خوا
لێمان رازییه، هه‌ر بۆیه ئه‌و سامانه‌شی رشتووه به‌سه‌رماندا ﴿[٣٦] قل إن ربی یبسط الرزق لمن یشاء ویقدر﴾ پێیان
بڵێ: رزق و رۆزی پێوه‌رێکی هه‌ڵه‌یه بۆ چاکیی و، خراپیی مرۆ، چونکه خواوه‌ندم بۆ هه‌رکه‌سێك خۆی بیه‌وێ رزق و
رۆزی فراوان ئه‌کات، وه بۆ هه‌ر که‌سێك بیه‌وێ که‌می ئه‌کاته‌وه، ئیتر ئه‌وکه‌سه چاك بێ، یان خراپ ﴿ولكن أكثر
الناس لا یعلمون﴾ به‌ڵام زۆربه‌ی خه‌ڵك نهێنی کاره‌کانمان نازانن ﴿[٣٧] وما اموالکم ولا اولادکم بالتی تقربکم عندنا
زلفی﴾ وه نه‌ماڵ و، نه منداڵتان شتێك نین که ئێوه به‌ئێمه‌وه نزیك بکه‌نه‌وه ﴿إلا من آمن وعمل صالحا﴾ به‌ڵام که‌سێك
بڕوایه‌کی راسته‌قینه‌ی هێنابێ و، کاری چاکی ئه‌نجام دابێ، ته‌نها بڕوای دامه‌زراوو کاری چاکه نزیکتان ئه‌کاته‌وه
به‌خوا، نه‌ماڵ و، نه‌منداڵ ﴿فأولئك لهم جزاء الضعف بما
عملوا﴾ بۆ ئه‌م که‌سانه له‌به‌رامبه‌ر کرده‌وه‌کانیانه‌وه
پاداشتی دووبه‌رامبه‌ر هه‌یه ﴿وهم فی الغرفات آمنون﴾ له
کۆشك و ته‌لاره به‌رزو بڵنده‌کاندا، به ئاسووده‌یی وخۆشیی
ژیان ئه‌به‌نه سه‌ر ﴿[٣٨] والذین یسعون فی آیاتنا معاجزین﴾ و
ئه‌وانه‌ش که بۆ په‌کخستنی ئایه‌ته‌کانی ئێمه هه‌وڵ ئه‌ده‌ن و
رێگری خه‌ڵك ئه‌که‌ن له‌ئیسلام و، واش ئه‌زانن ئه‌توانن
له‌ده‌سه‌ڵاتی ئێمه هه‌ڵبێن ﴿ولئك فی العذاب محضرون﴾ ئا
ئه‌وانه ئاماده ده‌کرێن له سزادا ﴿[٣٩] قل إن ربی یبسط الرزق
لمن یشاء من عباده ویقدر له﴾ پێیان بڵێ: به‌ڕاستیی
په‌روه‌رد گارم رزق و رۆزی ده‌به‌خشێ بۆ هه‌رکه‌سێك
له‌به‌نده‌کانی خۆی بیه‌وێ، بۆ هه‌رکه‌سێکیش خۆی بیه‌وێ
لێی که‌م ئه‌کات ﴿وما انفقتم من شئ فهو یخلفه﴾ ئێوه‌ش
هه‌ر شتێ ده‌به‌خشن له‌ڕێی خوادا، ئه‌وه خوا بۆتان قه‌ره‌بوو
ئه‌کاته‌وه‌و جێگایتان بۆ پڕئه‌کاته‌وه ﴿وهو خیر الرازقین﴾ وه
هه‌رئه‌ویشه چاکترین رۆزی به‌خشه.

الجزء الثاني والعشرون — سورة سبإ

وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ثُمَّ يَقُولُ لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ أَهَـٰٓؤُلَآءِ إِيَّاكُمْ كَانُوا۟ يَعْبُدُونَ (٤٠) قَالُوا۟ سُبْحَـٰنَكَ أَنتَ وَلِيُّنَا مِن دُونِهِم ۖ بَلْ كَانُوا۟ يَعْبُدُونَ ٱلْجِنَّ ۖ أَكْثَرُهُم بِهِم مُّؤْمِنُونَ (٤١) فَٱلْيَوْمَ لَا يَمْلِكُ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ نَّفْعًا وَلَا ضَرًّا وَنَقُولُ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلنَّارِ ٱلَّتِى كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ (٤٢) وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتُنَا بَيِّنَـٰتٍ قَالُوا۟ مَا هَـٰذَآ إِلَّا رَجُلٌ يُرِيدُ أَن يَصُدَّكُمْ عَمَّا كَانَ يَعْبُدُ ءَابَآؤُكُمْ وَقَالُوا۟ مَا هَـٰذَآ إِلَّآ إِفْكٌ مُّفْتَرًى ۚ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ إِنْ هَـٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ (٤٣) وَمَآ ءَاتَيْنَـٰهُم مِّن كُتُبٍ يَدْرُسُونَهَا ۖ وَمَآ أَرْسَلْنَآ إِلَيْهِمْ قَبْلَكَ مِن نَّذِيرٍ (٤٤) وَكَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَمَا بَلَغُوا۟ مِعْشَارَ مَآ ءَاتَيْنَـٰهُمْ فَكَذَّبُوا۟ رُسُلِى ۖ فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ (٤٥) ۞ قُلْ إِنَّمَآ أَعِظُكُم بِوَٰحِدَةٍ ۖ أَن تَقُومُوا۟ لِلَّهِ مَثْنَىٰ وَفُرَٰدَىٰ ثُمَّ تَتَفَكَّرُوا۟ ۚ مَا بِصَاحِبِكُم مِّن جِنَّةٍ ۚ إِنْ هُوَ إِلَّا نَذِيرٌ لَّكُم بَيْنَ يَدَىْ عَذَابٍ شَدِيدٍ (٤٦) قُلْ مَا سَأَلْتُكُم مِّنْ أَجْرٍ فَهُوَ لَكُمْ ۖ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ ۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ (٤٧) قُلْ إِنَّ رَبِّى يَقْذِفُ بِٱلْحَقِّ عَلَّـٰمُ ٱلْغُيُوبِ (٤٨)

٤٣٣

**فریشته له قیامه‌تدا به‌رائه‌ت له په‌رستیاره‌کانیان ده‌که‌ن:**

﴿[٤٠] و یوم یحشرهم جمیعا ثم یقول للملائکة﴾ بیر له‌و رۆژه بکه‌ره‌وه که‌خوا هه‌موان په‌رستراوو په‌رستیار کۆ
ئه‌کاته‌وه، له‌پاشان بۆ لۆمه‌ی په‌رستیاره‌کان به‌فریشته‌کان ئه‌ڵێت: ﴿هؤلاء إیاکم کانوا یعبدون﴾ ئاخۆ ڕاسته
ئه‌وانه‌بوون ئێوه‌یان ئه‌په‌رست؟ به‌فه‌رمانی ئێوه بوو؟ دیاره پرسیارو وه‌ڵامه‌که‌یش هه‌ر بۆ ئێش پێگه‌یاندنیانه، وه
له‌سووره‌تی (فرقان)دا ئه‌فه‌رمووێ: (أأنتم أضللتم عبادی هؤلاء أم هم ضلوا السبیل)١٧/٢٥. یاخود به (عیسا)
ئه‌فه‌رمووێ: (أأنت قلت للناس اتخذونی وأمی إلهین من دون الله..)١١٦/٥. ﴿[٤١] قالوا سبحانك انت ولینا من دونهم﴾
ئه‌وانیش ده‌ڵێن: خوایه! بێ عه‌یبی و پاك وخاوێنی له‌هاوبه‌ش هه‌ر بۆ تۆیه، هه‌ر تۆی گه‌وره‌و په‌رستراوو دۆستمان،
نه‌ك ئه‌وان ﴿بل کانوا یعبدون الجن﴾ نه‌خێر، ئه‌وان – به‌شی زۆریان – جنۆکه‌یان ئه‌په‌رست، هه‌ر وه‌کو له‌م
ئایه‌ته‌شدا هاتووه: (إن یدعون من دونه إلا إناثا وإن یدعون إلا شیطانا مریدا) ١١٧/٤. ﴿أکثرهم بهم مؤمنون﴾ و

زۆربه‌یان به جنییه‌كان بڕوایان هێنابوو، واته: باوه‌ڕیان كرد بوو به واده‌و به‌ڵێنیان ﴿ [٤٢] فاليوم لا يملك بعضكم لبعض نفعا ولا ضرا﴾ جا ئه‌مڕۆژه‌ی قیامه‌ته، هیچ كه‌سێك له‌ ئێوه ده‌سباری یه‌كتری ناده‌ن و، خاوه‌نی هیچ قازانج و زیانێك نین بۆ یه‌كتر ﴿ ونقول للذين ظلموا﴾ به‌وانه‌ش سته‌میانكردووه ئه‌ڵێین: ﴿ ذوقوا عذاب النار التي كنتم بها تكذبون﴾ ده‌ سزای ئه‌و ئاگره‌ بچێژن كه‌ بڕواتان پێی نه‌بوو و به‌درۆتان ده‌زانی.

**خوانه‌ناسان پێغه‌مبه‌ران تۆمه‌تبار ده‌كه‌ن:**

﴿ [٤٣] وإذا تتلى عليهم آياتنا بينات﴾ هه‌ر كه‌ ئایه‌ته‌ رووناكه‌كانی ئێمه‌یان به‌سه‌را بخوێنرێته‌وه ﴿ قالوا ما هذا إلا رجل يريد ان يصدكم عما كان يعبد اباؤكم﴾ ده‌ڵێن: ئه‌م پیاوه، (واته: موحه‌ممه‌دﷺ) هه‌ر پیاوێكه ده‌یه‌وێ له‌و شتانه‌ی باو باپیرانتان ئه‌یانپه‌رست ڕێتان لێ بگرێ ﴿ وقالوا ما هذا إلا إفك مفترى﴾ وتیشیان: ئه‌م قورئانه (موحه‌ممه‌دﷺ) ئه‌یڵێ: هه‌ر درۆیه‌كی هه‌ڵبه‌ستراوه له‌سه‌ر خوا ﴿ وقال الذين كفروا للحق لما جاءهم﴾ و ئه‌وانه‌ی كه بێ بڕوا بوون كاتێ قورئانیان بۆ هات پێیان وت: ﴿ إن هذا إلا سحر مبين﴾ ئه‌م قورئانه‌ ببێ و نه‌بێ هه‌ر جادوویه‌كی ئاشكرایه ﴿ [٤٤] وما آتيناهم من كتب يدرسونها﴾ و ئێمه پێشتر هیچ كتێب و نامه‌مان نه‌دابوونێ بیخوێننه‌وه تا نكوڵی بكه‌ن ﴿ وما ارسلنا إليهم قبلك من نذير﴾ پێش له‌تۆیش هیچ ترسێنه‌رێكمان بۆ نه‌ناردبوون تا له‌سزای خوا بیانترسێنێ ﴿ [٤٥] وكذب الذين من قبلهم﴾ وئه‌وانه‌ش له‌پێش مه‌ككه‌ییه‌كانه‌وه بوون، هه‌روا په‌یامبه‌رانیان به‌درۆزن داده‌نا! ﴿ وما بلغوا معشار ما آتيناهم﴾ له‌كاتێكدا قوره‌یش له‌چاو ده‌سه‌ڵاتی ئه‌وانه‌دا نه‌گه‌یشتبوون به‌ده‌یه‌كی ئه‌وه‌ی به‌وانمان دابوو له‌هێزو ده‌سه‌ڵات وماڵ و سامان، كه‌چی هه‌ر له‌ناویش چوون! ﴿ فكذبوا رسلي فكيف كان نذير﴾ ئینجا په‌یامبه‌ره‌كانی منیان به‌درۆزن دانا، ئێمه‌ش تۆڵه‌مان لێسه‌ندنه‌وه، جاچۆن بوو ئینكاری من بۆیان بۆ سزادانیان؟.

**هاوه‌ڵه‌كه‌تان (موحه‌ممه‌د ﷺ) لێوه‌ كار نییه:**

﴿ [٤٦] قل إنما أعظكم بواحدة﴾ ئه‌ی موحه‌ممه‌دﷺ بڵێ: من هه‌ر به‌یه‌ك وشه ئامۆژگاریتان ئه‌كه‌م ﴿ أن تقوموا لله مثنى وفرادى﴾ كه‌ له‌به‌ر خوا دوان دوان و یه‌كه یه‌كه‌ هه‌ستن به‌دڵسۆزی هه‌وڵ بده‌ن و كار بكه‌ن ﴿ ثم تتفكروا﴾ پاشان بیر بكه‌نه‌وه‌و تێفكرێن جائه‌و كاته‌ چاك ده‌زانن ﴿ ما بصاحبكم من جنة﴾ كه‌هه‌واڵه‌كه‌تان په‌یامبه‌ر ﷺ هیچ شێتی تێدا نییه، وه‌ك ئێوه‌ ئه‌ڵێن! ﴿ إن هو إلا نذير لكم﴾ به‌ڵكو ئه‌و هه‌ر ترسێنه‌رێكه‌ بۆتان ﴿ بين يدى عذاب شديد﴾ وده‌یه‌وێ له‌به‌رامبه‌ر سزایه‌كی زۆر توندوقورسی ڕۆژی قیامه‌ت بێدارتان بكات، چونكه‌ یه‌كه‌م نیشانه‌ی ڕۆژی دوایی، هاتنی ئه‌و پێغه‌مبه‌ره‌خۆیه‌تی.

**بێ پاره‌و پوول وته‌ماحێك، دینتان پێڕاده‌گه‌یه‌نم:**

﴿ [٤٧] قل ما سألتكم من اجر فهو لكم﴾ بڵێ: من هیچ پاداش و كرێیه‌كم لێتان ناوێ، واته: من له‌به‌رامبه‌ر ڕاگه‌یاندنی ئیسلامه‌كه‌مدا هیچ كرێ و دنیایه‌كم له‌ ئێوه‌ناوێ ﴿ إن أجرى إلا على الله﴾ پاداشت و كرێی من ته‌نها له‌سه‌ر خوایه ﴿ وهو على كل شئ شهيد﴾ وه‌ هه‌ر ئه‌و بۆ خۆی به‌سه‌ر هه‌موو شتێكا ئاگاداره ﴿ [٤٨] قل إن ربى يقذف بالحق﴾ بڵێ: به‌ڕاستیی په‌روه‌ردگاری من هه‌ق ده‌هاوێ به‌رووی ناهه‌قداو پووچه‌ڵی ئه‌كاته‌وه ﴿ علام الغيوب﴾ ئه‌و زانای نادیاره، واته: له‌ته‌واوی نهێنی و نادیاره‌كان به‌ئاگایه و،هیچ شتێك له‌و نادیار نیه ﴿ [٤٩] قل جاء الحق وما يبدئ الباطل وما يعيد﴾ پێیان بڵێ: هه‌ق و ڕاستیی(ئایینی یه‌كخوا په‌رستی)) هات و ده‌ركه‌وت، وه‌ پووچ و به‌تاڵیش (ئایینی شیرك) ڕۆشت و ناگه‌ڕێته‌وه، ﴿ [٥٠] قل إن ضللت فإنما اضل على نفسى﴾ بڵێ: ئه‌گه‌ر ڕێم هه‌ڵه

کردبێت, ئەوە هەر بۆخۆم ڕێم هەڵە کردووە, واتە:زیانەکەی هەر بۆ خۆم دەبێت ﴿وإن اهتديت فبما يوحي إلى ربي﴾ خۆ ئەگەر ڕێگای ڕاستم دۆزیبێتەوە, ئەوە بەهۆی ئەوەوە بووە کە پەروەردگارم وەحی بۆ کردوم ﴿إنه سميع قريب﴾ چونکە بەڕاستیی ئەو ژنەوایە، نزیکە، واتە: ژنە وایە بۆ گوفتاری من وئێوە,لێشمانەوە زۆر نزیکە ﴿٥١ ولو ترى إذ فزعوا فلا فوت﴾ ئەگەر ببینی کاتێ زیندو دەکرێنەوەو دەشڵەژێن , شتێکی گەورەو ناهەموار دەبینی ﴿وأخذوا من مكان قريب﴾ ئینجا لە جێگایەکی نزیکدا لەگۆڕەکەیان دەگیردرێن و دەبرێن بۆ ناو ئاگر ﴿٥٢ وقالوا آمنا به﴾ ئەوجا کە هەر سزاکەیان چاوکرد ,دەڵێن: باوەڕمان بە موحەممەد هێنا ﴿وأنى لهم التناوش من مكان بعيد﴾ وچۆن بۆیان هەیە پێگەیەك, واتە: تەنها دنیا جێی باوەڕ هێنان بوو, ئەمرۆ لەوە دوورکەوتوونەتەوەوئێستا قیامەتە و کاتی باوەڕ هێنان بە سەرچوو؟ ﴿٥٣ وقد كفروا به من قبل﴾ وبەڕاستی لەپێشەوە- کەدەرفەتی باوەڕهێنان بوو- باوەڕیان پێ نەهێنا ﴿ويقذفون بالغيب من مكان بعيد﴾ وە لە دوورەوە زاریان لەنادیار دەدا, واتە:دەیانوت:زیندووبوونەوە وبەهەشت وئاگر نیە! ﴿٥٤ وحيل بينهم وبين ما يشتهون﴾ وە سەرەنجام تەگەرەدەخرێتە نێوان ئەوان و,ئەوەی ئارەزووی دەکەن لەوەر گێرانی ئیمان لێیان ,واتە: هەرکە مردن, ڕێگا نادرێن باوەڕ بێنن ﴿كما فعل بأشياعهم من قبل﴾ هەروەکو هاوشێوەکانیشیان بەرلە خۆیان بەو دەردەچوون، ئەمانیش پاش لەدەستدەرچوونی سات و کات، ئەوسا باوەڕ دەهێنن، بەڵام هیچ کەڵکی نابێ بۆیان ﴿إنهم كانوا في شك مريب﴾ چونکە بەڕاستیی, دەربارەی زیندووبوونەوەو, لێپرسینەوە, ئەوانیش وەك ئەمان لەگومانێکی دژوارو گومان هێنەردا بوون!!.

سوپاسی بێپایانم بۆ پەروەرندەی جیهانیان، کە یارمەتیدام بۆ تەواو کردنی تەفسیری سوورەتی (سەبەء).

*** *** ***

## ٣٥- سوورەتی ( فاتیر )ـە

## مەککەییەو ( ٤٥ ) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتی (فاتیر)ـە لەمەککەدا -کەمێ پێش کۆچی پەیامبەرﷺ بۆ مەدینە - هاتۆتە خوارێ، ئەمیش هەر بەو شارێگەیەدا دەچێت کە سوورەتە مەککەییەکانی دی پیا دەچن، بانگهێشە بۆیەکتاپەرستیی‌و تاك وتەنیایی خوا ئەکا، ڕاستکردنەوەی چەندین بەڵگە لەسەر بوونی خوای باڵا دەست وتاك وتەنیایی، بۆ تێکشکانی قەڵاو بنکەکانی شیرك و موشریکین، و هەڵنان لەسەر پاککردنەوەی دڵەکان لەڕەوشتە پەستەکان و، خۆ ئارایشدان بەخووو ڕەوشتە بەرزەکان.

* باسی دەسپێکردنی سەرەتای ژیان ئەکات، کە لە لایەن بەدیهێنەری بوونەوەرەوە سەرچاوەی گرتووە، پاشان هێنانەوەی چەندان بەڵگە لەم دونیایەدا لەسەر گونجانی زیندوو بوونەوە، بۆنمونە: زەویی پاش مردنیی ئەبووژێتەوە، ڕوواندن وسەوز بوونی جۆراوجۆری دانەوێڵە و میوەو گیاو ڕووەك.. هاتنی شەوو ڕۆژ، بەدوای یەکدا، ئینجا مرۆڤ هەر لەنوتفەوە تا دەبێتە خوێنپارەو، گۆشت پارە، ئێسك، هێنانی گۆشت بەسەر ئێسکە کاندا.. ئەوسا گیان بەبەرا کردنی و تەکلیف و مافەکانی..

* جیاوازییەکی زۆر لەنێوان باوەڕدارو بێباوەڕدا هەیە" ئیماندار بینایەو، خوانەناس نابینا.

* چەند جۆر میوەی جیاواز لە تام و ڕەنگ و ڤیتاميناتدا، ئادەمیی و جموجوڵ وکارەکانی، هاوڕێ لەگەڵ جیاوازیی ڕەنگ و شکڵی کێوو بەردەکان لەنێوان سپی و ڕەش و سووردا.. هەمووشیان پڕ بە دەم شایەتی دەدەن بەگەورەیی و دەسەڵاتی خوای کارجوان.

* جێنشینکردنی ئوممەتی پەیامبەر ﷺ لە جێی ئوممەتانی ترداو" خەڵاتکردنی بە بەرزترین وپیرۆزترین پەیامی ئاسمانیی، پاشان دابەشبوونی ئادەمزاد بەسێ بەش: ئاکارچاك، کەمتەرخەم وگوێ نەدەر، پێشبڕکێکار بۆ ئەنجامدانی کارەچاکەکان.

الجزء الثاني والعشرون　　سورة سبأ

قُلْ جَاءَ الْحَقُّ وَمَا يُبْدِئُ الْبَاطِلُ وَمَا يُعِيدُ ﴿٤٩﴾ قُلْ إِن ضَلَلْتُ
فَإِنَّمَا أَضِلُّ عَلَىٰ نَفْسِي وَإِنِ اهْتَدَيْتُ فَبِمَا يُوحِي إِلَيَّ رَبِّي إِنَّهُ
سَمِيعٌ قَرِيبٌ ﴿٥٠﴾ وَلَوْ تَرَىٰ إِذْ فَزِعُوا فَلَا فَوْتَ وَأُخِذُوا مِن
مَّكَانٍ قَرِيبٍ ﴿٥١﴾ وَقَالُوا آمَنَّا بِهِ وَأَنَّىٰ لَهُمُ التَّنَاوُشُ مِن
مَّكَانٍ بَعِيدٍ ﴿٥٢﴾ وَقَدْ كَفَرُوا بِهِ مِن قَبْلُ وَيَقْذِفُونَ
بِالْغَيْبِ مِن مَّكَانٍ بَعِيدٍ ﴿٥٣﴾ وَحِيلَ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ مَا يَشْتَهُونَ
كَمَا فُعِلَ بِأَشْيَاعِهِم مِّن قَبْلُ إِنَّهُمْ كَانُوا فِي شَكٍّ مُّرِيبٍ ﴿٥٤﴾

سُورَةُ فَاطِرٍ　　مكية ٣٥　　آياتها ٤٥

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
الْحَمْدُ لِلَّهِ فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ جَاعِلِ الْمَلَائِكَةِ رُسُلًا أُولِي
أَجْنِحَةٍ مَّثْنَىٰ وَثُلَاثَ وَرُبَاعَ يَزِيدُ فِي الْخَلْقِ مَا يَشَاءُ إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ
شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿١﴾ مَّا يَفْتَحِ اللَّهُ لِلنَّاسِ مِن رَّحْمَةٍ فَلَا مُمْسِكَ لَهَا
وَمَا يُمْسِكْ فَلَا مُرْسِلَ لَهُ مِن بَعْدِهِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿٢﴾ يَا أَيُّهَا
النَّاسُ اذْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ هَلْ مِنْ خَالِقٍ غَيْرُ اللَّهِ يَرْزُقُكُم
مِّنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ ﴿٣﴾

وَإِن يُكَذِّبُوكَ　　٤٣٤

* کۆتاییشی بە سەرزەنشتکردنی هاوبەشدانەرەکان دێت.

**توانایی خوای کار دروست:**

﴿بسم الله الرحمن الرحيم * [1] الحمد لله فاطر السموات والارض﴾ سوپاس و ستاییش و شوکرانە هەر بۆخوای بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەویی، کە بەجوانترین شێوەو بێ ئەوەی لەپێشەوە بناغەیەکیان بووبێ دایهێناون ﴿جاعل الملائكة رسلا﴾ بگێڕی فریشتەکان بەنێردراو بۆ گەیاندنی پەیامی خۆی بە پەیامبەران ﴿اولی أجنحة مثنى وثلاث ورباع﴾ فریشتەکانی خاوەنی دووباڵ و سێباڵ و چوار باڵ، لەئاسمانەوە بە و باڵانە بەرەو ڕووی زەویی دێن و ئەگەڕێنەوە. واتە: خاوەن توانایەکی وەهان، هەر چۆنێ بیانەوێ کار بکەن ئەیکەن. پێشەوا (موسلیم) لە(ئیبن مەسعوود)ەوە ئەڵێت: ((إن النبى ﷺ رأى جبريل فى صورته له ستمأة جناح))، واتە: بەڕاستیی پێغەمبەر ﷺ جوبریلی لەسوورەت وديمەنی خۆیا دیت" کە خاوەنی ٦٠٠ شەش سەت باڵبوو. ﴿يزيد فى الخلق ما يشاء﴾ خۆی هەر شتێکی حەز لێبکا لەدروستکردنی باڵ بۆ فریشتەکان و" هەرچی تر زیادی ئەکات ﴿إن الله على كل شئ قدير﴾ چونکە بەڕاستیی خوا بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە ﴿[2] ما يفتح الله للناس من رحمة فلا ممسك لها﴾ خوا هەر نیعمەتێك بنێرێ دەرگای، هیچ ڕاگرێك نیە بۆی و کەسێك ناتوانێ گاڵەی بداونەهێڵێ ﴿وما يمسك فلا مرسل له من بعده﴾ هەرچیش ڕاگرێ و بیەوێ نەبێت، ئەوا هیچ کەسێك ناتوانێ لەدەستیی دەرکاوبەرەڵای بکات لە دوای خۆی، جائەم ئایەتەی: (وان يمسسك الله بضر فلا كاشف له إلاهو وإن يردك بخير فلا راد لفضله..)١٠/١٠٧ هەر ئەو ڕاستیە دووپات دەکاتەوە. ﴿وهو العزيز الحكيم﴾ هەر ئەویشە زۆر بە دەسەڵات، زۆر کارجوان وهەموو شتێ لەجێی خۆیدا ئەکات و، هیچ کەسیش ناتوانێ نەهێڵێ ﴿[3] يا أيها الناس اذكروا نعمة الله عليكم﴾ ئەی خەڵکینە! هەردەم یادی نیعمەت وچاکەی خوا بکەن بەسەرتانەوە ﴿هل من خالق غير الله﴾ ئاخۆ بێجگە لەخۆی بەدیهێنەرێك هەیە؟ ﴿يرزقكم

من السماء والأرض﴾ بژێوی و ڕۆزیتان بدا لەئاسمان و زەوییدا؟ ﴿لا إله إلا هو﴾ بێجگە لە خۆی هیچ پەرسراوێکی
هەق نیە ﴿فأنی تؤفکون﴾ جا ئیتر چۆن لادەدرێن لە یەکخوا پەرستی بۆ پەرستنی فرە خواپەرستی ولە ڕاستە ڕێ
چەواشە دەبن؟.

### پێغەمبەرانی بەر لە تۆشیان بە درۆزن دانا!:

﴿٤ وإن یکذبوك فقد کذبت رسل من قبلك﴾ ئەگەر ئەمانەش تۆ بەدرۆزن بزانن! بێتاقەت مەبە، چونکە
پەیامبەرێکی زۆریش بەر لەتۆ بەدرۆزن دانران و خۆیان ڕاگرت و کۆڵیان نەدا ﴿وإلی الله ترجع الأمور﴾ ئاشکرایە کە
دەرەنجامی هەمووکارو بارەکان هەر بۆلای خوا دەگێردرێتەوە ﴿٥ یا أیها الناس إن وعدالله حق﴾ ئەی خەڵکینە!
بەڕاستیی بەڵێنی خوا بەهاتنی ڕۆژی پاداش وتۆڵە ڕاستە
﴿فلا تغرنکم الحیاة الدنیا﴾ جا با ژیانی ئەم دونیایە
نەتانخەڵەتێنێ وچەواشە نەبن پێی ﴿ولا یغرنکم بالله
الغرور﴾ وەبا شەیتانی فریوکار بە حیلم وبەخشندەیی و
میهرەبانی خوا فریوتان نەدا و تەماع بخاتە بەرتان و پێتان
بڵێ: ڕەحمی خوا زۆرە! هەرچەندە گوناه بکەن، خوا هەر
لێتان خۆش ئەبێت ﴿٦ إن الشیطان لکم عدو﴾ بێگومانە
شەیتان دوژمنتانە ﴿فاتخذوه عدوا﴾ دەسا ئێوەیش ئەو
بەدوژمن بگرن و ڕەفتارەکانی ئەو وەلانێن ﴿إنما یدعو حزبه
لیکونوا من أصحاب السعیر﴾ چونکە بەڕاستیی ئەو هەر
گروپ و شوێنکەوتووانی خۆی بانگ ئەکات، بۆئەوەی
پێکەوە ببنە یارو هاوەڵی ئاگری دۆزەخی هەڵگیرساوی
بڵێسەدار.

الجزء الثاني والعشرون — سورة فاطر

وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ
﴿٤﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا
وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ ﴿٥﴾ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَٱتَّخِذُوهُ
عَدُوًّا إِنَّمَا يَدْعُواْ حِزْبَهُۥ لِيَكُونُواْ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿٦﴾ ٱلَّذِينَ
كَفَرُواْ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُم
مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ ﴿٧﴾ أَفَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ فَرَءَاهُ حَسَنًا
فَإِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ فَلَا تَذْهَبْ نَفْسُكَ
عَلَيْهِمْ حَسَرَٰتٍ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴿٨﴾ وَٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ
ٱلرِّيَٰحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَسُقْنَٰهُ إِلَىٰ بَلَدٍ مَّيِّتٍ فَأَحْيَيْنَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ
مَوْتِهَا كَذَٰلِكَ ٱلنُّشُورُ ﴿٩﴾ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعِزَّةَ فَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ جَمِيعًا
إِلَيْهِ يَصْعَدُ ٱلْكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ وَٱلْعَمَلُ ٱلصَّٰلِحُ يَرْفَعُهُۥ وَٱلَّذِينَ
يَمْكُرُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَمَكْرُ أُوْلَٰٓئِكَ هُوَ يَبُورُ
﴿١٠﴾ وَٱللَّهُ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ جَعَلَكُمْ أَزْوَٰجًا
وَمَا تَحْمِلُ مِنْ أُنثَىٰ وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلْمِهِۦ وَمَا يُعَمَّرُ مِن مُّعَمَّرٍ
وَلَا يُنقَصُ مِنْ عُمُرِهِۦٓ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ﴿١١﴾

٤٣٥

### پاداشت و تۆڵەی ڕۆژی سەلا:

﴿٧ الذین کفروا لهم عذاب شدید﴾ ئەوانەی وا کافرو
بێبڕوان، سزایەکی توندو قورسیان بۆ هەیە ﴿والذین آمنوا
وعملوا الصالحات﴾ و ئەوانەیش کە بڕوایان هێناو کارە
چاکەکانیان ئەنجامدا ﴿لهم مغفرة وأجر کبیر﴾ لێبوردن و پاداشێکی گەورەیان بۆ هەیە ﴿٨ أفمن زین له سوء عمله
فرآه حسنا﴾ ئاخۆ کەسێك کاری خراپی خۆی لا شیرین کرابێ، ئنجا بەچاکی بزانێ، وەکو کەسێك وایە کە بەخراپی
بزانێ و، خۆی دووربگرێ لێی؟ دیارە نەخێر ﴿فإن الله یضل من یشاء ویهدی من یشاء﴾ جا بەڕاستیی خوا گومڕا
دەکات، ئەوەی بیەوێ گومڕای ئەکات، ڕێنماش دەکات ئەوی بیەوێ و بزانێ بەکەڵکی هیدایەت دێت ﴿فلا تذهب
نفسك علیهم حسرات﴾ جا تۆ ئەی پێغەمبەرﷺ! لەداخی ئەوان خۆت لەناو مەبە ﴿إن الله علیم بما یصنعون﴾
بەڕاستیی خوا چاك دەزانێ ئەوان چ کارێ ئەنجام ئەدەن وچی لە هەگبەکەیاندایە؟.

**بەڵگەی ژیانی دوای مردن:**

﴿٩ والله الذى ارسل الرياح﴾ هەرئەو خوایە خۆیەتی بایەکانی نارد ﴿فتثير سحابا﴾ جا ئەوانیش هەورەکان دەجوڵێنن ﴿فسقناه إلى بلد ميت﴾ ئینجا بۆ خۆشمان ناردمان بۆهەر وڵات وشارێکی مردوو, واتە: بۆهەر زەوییەکی وشك و لە هێز کەوتووو تینوو ﴿فأحيينا به الأرض بعد موتها﴾ ئەوسا بەوئاوە ئەو زەوییەمان زیندوو کردەوە, دوای مردنی و وشکبوونی ﴿كذلك النشور﴾ دیارە زیندووبوونەوەو ژیاندنەوەی مردووەکانیش هەر ئاوایە، واتە: ئەو خوایە هەر چۆنێ دەتوانێ زەویی مردوو زیندوو بکاتەوە" هەر ئاواش دەتوانێ بەئاسانی ئێوەش زیندوو بکاتەوە، خوای گەورە لەگەڵ ئایەتدا زیندووکردنەوەی زەویی دەکاتە بەڵگە بۆ زیندوو کردنەوەی مردووەکانیش، وەك ئەفەرمووێ: (.. إهتزت وربت وانبتت من كل زوج بهيج)٢٢/٥. لە فەرموودەیەکی راستیشدا هاتووە: ((كل ابن آدم يبلى إلا عجب الذنب، منه خلق، ومنه يركب))متفق عليه. ﴿١٠ من كان يريد العزة فلله العزة جميعا﴾ هەرکەسێك قەدرو رێزو عیززەت و سەربەرزیی دەوێ , دەبێ ملکەچی فەرمانەکانی خوا بێت، ئەوە عیززەت و رێزی دنیا وقیامەت بۆ ئەوە، ئایەتی: (ولا يحزنك قولهم إن العزة لله جميعا..) لە تەك ئایەتی: (..أيبتغون عندهم العزة فإن العزة لله جميعا..) هەروا ئایەتی: (ولله العزة ولرسوله وللمؤمنين...) ئەو راستیە دەچەسپێنن. ﴿إليه يصعد الكلم الطيب﴾ هەموو وشەیەکی پیرۆزو پاك – وەك یادکردنی خواو دۆعاو پاڕانەوەو قورئان خوێندن – بۆلای خوا سەرئە کەوێ ﴿والعمل الصالح يرفعه﴾ وەهەموو قسەو ئاکارێکی چاك وپاکیش بەرەو لایخۆی بەرزی ئەکاتەوە وەریدەگرێوقبوڵی ئەکات ﴿والذين يمكرون السيئات لهم عذاب شديد﴾ ئەوانەش کەفرت وفێڵ دەکەن و, لە دژت پیلان دەگێڕن , واتە: نەخشەی خراپەکاری دەکێشن و ڕیابازن, سزای سەختیان بۆهەیە لەپاشەڕۆژدا ﴿ومكر أولئك هو يبور﴾ خۆ دیارە کە پیلان و فرت وفێڵی ئەوانە پووچەڵ وفاسید ئەبێ, چونکە هەرچی ئەکەن خوا ئاگادارە پێی و ئاشکرای دەکات ﴿١١ والله خلقكم من تراب ثم من نطفة﴾ خوا(الله) بوو باوکی ئێوەی(ئادەم) لەگڵێکی سادە، پاشان خۆتانی لە تنۆکە ئاوێکی قێزەون دروستکرد ﴿ثم جعلكم أزواجا﴾ ئەوسا جووت ونێرو مێی لێ فەراهەمهێنان ﴿وما تحمل من انثى ولا تضع إلا بعلمه﴾ و هەر مێینەیەکیش، ئاوس و دووگیان دەبێ و، حەملەکەی دادەنێ, خوا پێی ئەزانێ, واتە: بێزانینی ئەو هیچ شتێك نابێ ﴿وما يعمر من معمر ولا ينقص من عمره إلا فى كتاب﴾ لە تەمەنی هیچکەس زیاد ناکرێ و, لە تەمەنی هیچ کەسیش کەم ناکرێ , مەگەر هەموو لەنامەیەکدا نووسراوەو تۆمار کراوە ,واتە: ئەوانەو هەر ڕووداوێکی تر ,هەرلە(ئەزەل) لە (لوح المحفوظ)دا تۆمار کراوەو گۆڕانی بەسەردا نایە ﴿إن ذلك على الله يسير﴾ بەڕاستیی ئەوەش بۆخوا ئاسانە.

**هێندێ لە نیعمەتەکانی خوا:**

﴿١٢ وما يستوى البحران﴾ ئەم دوودەریایەش وەکو یەك نین ﴿هذا عذاب فرات سائغ شرابه﴾ کە ئەمەیان ئاوەکەی بۆخواردنەوە شیرین وخۆشگەوارە وتینوویەتی ئەشکێنێ وەکو ئەوهەموو چۆم وکانیاوانە لەبەردەستدان ﴿وهذا ملح أجاج﴾ و ئەوەشیان شۆرێکی سوێروتفت وتاڵە گەروو ئەسووتێنێو, بەکەڵکی خواردنەوە نایەت, وەکو گەلێ لە زەریاکانی دنیا ﴿ومن كل تأكلون لحما طريا﴾ وە لەهەردووکیشیان گۆشتێکی تەڕو فەریکەو تازەو ناسکی ماسیی دەخۆن، دیارە ئەمەیش بەهرە یەکێتری خوایەو بەڵگەیەکی زۆرمەزنە بۆی ﴿وتستخرجون حلية تلبسونها﴾ خشڵیشیان لێدەردێنن بۆ جوانی و زینەت و خۆئاراییشدان، وەك مرواریی‌و دوڕو مەرجان، وەکو دەفەرموێ: (يخرج منهما اللؤلؤ والمرجان) ٥٥/٢٢ ﴿وترى الفلك فيه مواخر﴾ دەشبینی کەشتییەکان ئەودەریایانە لەت ئەکەن

ودێن ودەچن ﴿تبتغوا من فضله﴾ تا ئێوەش بەهرەی خوا(ڕسق و ڕۆزی) بەدەست بێنن، واتە: بەو کەشتییانە بازرگانی بکەن و، ڕۆزی حەلاڵ وپاك پەیدا بکەن لەم شارو ئەوشار ﴿ولعلكم تشكرون﴾ بەشکو سوپاسگوزاریی لەسەر بکەن.

**بتەکان: تەنانەتی توێکڵی تەنکی دەنکی خورماش شك نابەن:**

﴿[13] يولج الليل فى النهار ويولج النهار فى الليل﴾ یەکێ تر لە نیشانەکانی دەسەڵاتی خوای باڵادەست ئەوەیە کە: شەودەخاتە سەر ڕۆژ، دیارە ئەوکاتە ڕۆژ درێژ ئەبێت و، ڕۆژیش دەخاتە سەر شەو ،ئەوکاتەش شەو درێژ ئەبێت ﴿وسخر الشمس والقمر كل يجرى لأجل مسمى﴾ و خۆرو مانگیشی ڕامکرد لەبەر بەرژەوەندی بەندەکانی خۆی، هەرکامێ لەخولگەی خۆشیاندا تا ئەوکاتە بۆیان دیاریکراوە دێن ودەچن ﴿ذلكم الله ربكم له الملك﴾ ئەوە ئەوانە دەکا، پەروەردگاری ئێوەیە، دەسەڵات و پادشاییش هەر بۆئەوەو هەرلەویش ئەوکارانە دەوەشێتەوە, جا ئاخۆ دەسەڵاتدارێکی ئاوا پەرستنیی هەقنییە؟ ﴿والذين تدعون من دونه﴾ ئەو شتانەش بێجگە لە (خوا) ئێوە(ئەی کافرانی قورەیش!) ئەیانپەرستن ﴿ما يملكون من قطمير﴾ تەنانەتی بەئەندازەی قلێشی نێودەنکە خورما یەکیش، وە یا بەئەندازەی توێژێکی سپی ناسك کە لەدەوری نێوکەکەدایە، شك نابەن و دەسەڵاتیان نییە ﴿[14] إن تدعوهم لا يسمعوا دعاءكم﴾ ئەگەر بانگیشیان لێبکەن هاوارەکەتان نابیسن ﴿ولو سمعوا ما استجابوا لكم﴾ گریمان گەربش بیسن , وەڵامتان نادەنەوە, چونکە خاوەن دەسەڵات و وتە نین ﴿ويوم القيامة يكفرون بشرككم﴾ و ڕۆژی قیامەتیش نکووڵی شیرك وپەرستنەکەتان ئەکەن بۆخۆیان ﴿ولا ينبئك مثل خبير﴾ هیچ کەسێك وەك خوا کە ئاگاداری هەموو شتێکە ناتوانێ لەوکارانە ئاگادارت بکات.

الجزء الثاني والعشرون — سورة فاطر

وَمَا يَسْتَوِي الْبَحْرَانِ هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ سَائِغٌ شَرَابُهُ وَهَٰذَا
مِلْحٌ أُجَاجٌ وَمِن كُلٍّ تَأْكُلُونَ لَحْمًا طَرِيًّا وَتَسْتَخْرِجُونَ
حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا وَتَرَى الْفُلْكَ فِيهِ مَوَاخِرَ لِتَبْتَغُوا مِن فَضْلِهِ
وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٢﴾ يُولِجُ اللَّيْلَ فِي النَّهَارِ وَيُولِجُ
النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِي
لِأَجَلٍ مُّسَمًّى ذَٰلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ الْمُلْكُ وَالَّذِينَ
تَدْعُونَ مِن دُونِهِ مَا يَمْلِكُونَ مِن قِطْمِيرٍ ﴿١٣﴾ إِن
تَدْعُوهُمْ لَا يَسْمَعُوا دُعَاءَكُمْ وَلَوْ سَمِعُوا مَا اسْتَجَابُوا لَكُمْ
وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكْفُرُونَ بِشِرْكِكُمْ وَلَا يُنَبِّئُكَ مِثْلُ خَبِيرٍ
﴿١٤﴾ ۞ يَا أَيُّهَا النَّاسُ أَنتُمُ الْفُقَرَاءُ إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ هُوَ الْغَنِيُّ
الْحَمِيدُ ﴿١٥﴾ إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ ﴿١٦﴾
وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ بِعَزِيزٍ ﴿١٧﴾ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ وَإِن
تَدْعُ مُثْقَلَةٌ إِلَىٰ حِمْلِهَا لَا يُحْمَلْ مِنْهُ شَيْءٌ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰ
إِنَّمَا تُنذِرُ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِالْغَيْبِ وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ
وَمَن تَزَكَّىٰ فَإِنَّمَا يَتَزَكَّىٰ لِنَفْسِهِ وَإِلَى اللَّهِ الْمَصِيرُ ﴿١٨﴾

نصف الحزب ٤٤

وما يستوي ٤٣٦

**خەڵکی نیازیان بەخوایە , هەموو کەسیش گوناهی خۆی بەکۆڵیەوە:**

﴿[15] ياايهاالناس انتم الفقراء إلى الله﴾ ئەی خەڵکینە! ئێوە هەژارن و نیازتان بە خوا هەیە ﴿والله هو الغنى الحميد﴾ ئەو بێ نیازو سوپاسکراوە ،هەرچەندە خەڵکی ململانێ بکات ﴿[16] إن يشأ يذهبكم ويأت بخلق جديد﴾ ئەگەر بیەوێ ئێوە لەناو ببا و، خەڵکێکی تازە بێنێت, وادەکات ﴿[17] وما ذلك على الله بعزيز﴾ ئەوکارەش بۆ خوا گران نیە ﴿[18] ولاتزر وازرة وزر اخرى﴾ لەڕۆژی قیامەتا هیچ کەس باری گوناهی هیچ کەسێکیتر هەڵناگرێ , واتە:هەموو کەسێك تاوانی خۆی بە کۆڵی خۆیەوەتی ﴿وإن تدع مثقلة إلى حملها﴾ خۆ ئەگەر کەسێکی گوناهکاری بارقورس – بەتاوان– لەبەر کەسێکیتر بپاڕێتەوە بۆ سووککردنی تاوانەکانی ﴿لا يحمل منه شئ﴾ هیچ شتێکی بۆهەڵناگیرێ ﴿ولو كان ذا قربى﴾ ئەگەرچی خزمی نزیکیشیبێ, چونکە هەموو کەسێك سەرگەرمی تاوانی خۆیەتی،

وەك ئەفەرمووێ: (..لایجزی والدعن ولده ولا مولود هو جاز عن والده شیئا..)٣٣/٣١. یان دەفەرموێ: (یوم یفر المرء من أخیه وأمه وأبیه وصاحبته وبنیه..)٨٠/٣٤-٣٦. ﴿إنما تنذر الذین یخشون ربهم بالغیب﴾ بەڕاستیی تۆ - ئەی موحەممەد ﷺ - هەر ئەوەندەت لەسەرە ئەوانە بترسێنیت کە بەنهێنی ونادیارلەپەروەردگاری خۆیان ئەترسن، واتە: ئەمانە شایستەی ئەوەن کەخۆت لەگەڵیاندا ماندوو بکەیت ﴿وأقاموا الصلاة﴾ بەڕێکوپێکیش نوێژ ئەکەن ﴿ومن تزکی فإنما یتزکی لنفسە﴾ وە ئەوەی خۆی لە چڵك و چەپەڵی گوناح پاك بکاتەوەو,گەشە بەخۆی بدات، قازانج وکەڵکەکەی بۆخۆیەتیی وتەزکیەی بۆخۆیکردووە ﴿وإلی الله المصیر﴾ و ئەنجام وگەڕانەوەی هەموانیش هەربۆلای خوایە.

سُورَةُ فَاطِر — الجزء الثاني والعشرون

وما یستوی الأعمی والبصیر ﴿١٩﴾ ولا الظلمت ولا النور ﴿٢٠﴾ ولا الظل ولا الحرور ﴿٢١﴾ وما یستوی الأحیاء ولا الأموت إن الله یسمع من یشاء وما أنت بمسمع من فی القبور ﴿٢٢﴾ إن أنت إلا نذیر ﴿٢٣﴾ إنا أرسلنك بالحق بشیرا ونذیرا وإن من أمة إلا خلا فیها نذیر ﴿٢٤﴾ وإن یکذبوك فقد کذب الذین من قبلهم جاءتهم رسلهم بالبینت وبالزبر وبالکتب المنیر ﴿٢٥﴾ ثم أخذت الذین کفروا فکیف کان نکیر ﴿٢٦﴾ ألم تر أن الله أنزل من السماء ماء فأخرجنا به ثمرت مختلفا ألونها ومن الجبال جدد بیض وحمر مختلف ألونها وغرابیب سود ﴿٢٧﴾ ومن الناس والدواب والأنعم مختلف ألونه کذلك إنما یخشی الله من عباده العلمؤا إن الله عزیز غفور ﴿٢٨﴾ إن الذین یتلون کتب الله وأقاموا الصلوة وأنفقوا مما رزقنهم سرا وعلانیة یرجون تجرة لن تبور ﴿٢٩﴾ لیوفیهم أجورهم ویزیدهم من فضله إنه غفور شکور ﴿٣٠﴾

٤٣٧

**باوەڕدارو بێ باوەڕ وەکو یەك نین:**

﴿[١٩] وما یستوی الأعمی والبصیر﴾ نابیناو بینا, وەکو یەك نین، واتە: مرۆڤی بڕوادارو بێبڕوا چونیەکنین ﴿[٢٠] ولا الظلمات ولا النور﴾ وەنە تاریکییەکان و، نە رووناکاییش, واتە:نە بێباوەڕیی وگومڕایی, نە ئیمان وباوەڕ, هیچیان وەکو یەك نین ﴿[٢١] ولا الظل ولا الحرور﴾ وەنەسێبەرو گەرمای تاوداریش, واتە: بەهەشت وئاگریش وەکو یەك نین.

ئیمامی (موسلیم) لەئەبو هورەیرە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((قالت النار: رب! أکل بعضي بعضا فأذن لي أتنفس، فأذن لها بنفسین، نفس في الشتاء، ونفس في الصیف، فما وجدتم من برد أو زمهریر فمن نفس جهنم، وما وجدتم من حر أو حرور فمن نفس جهنم)). واتە: ئاگری دۆزەخ گوتیەتی: ئەی پەروەردگارم! وا خەریکە خۆم ئەخۆمەوە، مۆڵەتم بدە باهەناسەیە بدەم! جاخواش مۆڵەتی دووهەناسەیدا، هەناسەیە بەزستاندا، هەناسە بەهاوێندا، ئەوجا ئەگەرهەر سەرماو زوقمێکتان دیت, ئەوە لەهەناسەدانی جەهەندەمەوەیە، وەهەڵمەتیهەر گەماریەکتان دیت، ئەوەش لە هەناسەدانی جەهەندەمەوەیە. ﴿[٢٢] وما یستوی الأحیاء ولا الأموات﴾ زیندووەکان و، مردووەکانیش , یەکساننین، واتە: ئەوانەی دڵیان ئاوەدانە بەئیمان زییندوون، ئەوانەیش دڵیان وێرانە کافرن، دەسا هەرگیز ئەودوانە یەکسان نین هەروەك ئەوشتانە چوونیەکنین ﴿إن الله یسمع من یشاء﴾ بەڕاستیی خوا دەبیسێنێ بە هەرکەسێ خۆی بیەوێ, واتە:گەر حەزبکا پەیامی خۆی بەگوێی هەرکەسێکدا بدا، دڵیگوشادوفراوان ئەکات وپێی ئەبیسێنێ، چونکە ئەوکەسە خۆی ئامادەیە ﴿وما انت بمسمع من فی القبور﴾ تۆ ناتوانی دەنگت بەوانە بگەیەنیت لەگۆڕدان، واتە: بەوکافروخوانەناسانە کە وەك مردووی ناو گۆڕ وانەو، هیچ شتێك نابیستن ﴿[٢٣] إن انت إلا نذیر﴾ تۆش هەر ترسێنەرێکیت, واتە: پێغەمبەرێکی ترسێنەری خوایت ﴿[٢٤] إنا ارسلناك بالحق بشیرا ونذیرا﴾ بێگومان ئێمە تۆمان نارد بەئایینی راست, بە موژدەدەرو ترسێنەر بۆ مەردم ﴿وإن من امة إلا خلا فیها نذیر﴾ و هیچ ئوممەت

و گـەلێکیش نـەبووە- بەرلـە تـۆ- ترسـێنەرێکیان بـۆ نەچـووبێ، وەك دەفـەرموێ: (إنما انت منذر ولكل قوم هاد)٧/١٣. یـان دەفـەرموێ: (ولقد بعثنا فی كل امة رسولا ان اعبدوا الله واجتنبوا الطاغوت)٣٦/١٦. ﴿[٢٥] وان یكذبوك﴾ ئەگەر ئەمانە تۆ بەدرۆزن دادەنێن و بڕوات پێ ناکەن ﴿فقد كذب الذین من قبلهم﴾ خۆ بێگومان ئەوانەی پـێش ئـەوانیش پەیامبـەرەکانیان بـە درۆزن کـرد! ﴿جاءتهم رسلهم بالبینات﴾ پێغەمبەرەکانیان بـۆ هـاتن بەگـەڵ بەڵگەو نیشانەی روونەوە ﴿وبالزبر وبالكتاب المنیر﴾ و بە سپاردەو کتێبێکی رووناك و دروخشانەوە,وەك(تەورات و، ئینجیل و، زەبوور) کەچی لەگەڵ ئەوەشدا، هەر بڕوایان پـێ نـەهێنان، جا تـۆیش - وەك ئـەوان - خـۆ ڕاگربـەو ئارامت هەبێ ﴿[٢٦] ثم اخذت الذین كفروا﴾ پاشان ئەوانەی کە بێ بڕوا بوون بەغەزەب گرتمن ﴿فكیف كان نكیر﴾ دە ئایا سزای من چۆن بوو؟.

**روونکردنەوەی توانستی خوا:**

﴿[٢٧] الم تر ان الله انزل من السماء ماء﴾ ئاخۆ نـەتبینی خـوا ئاوێکی پیرۆزی لـەو حـەواوە باراند ﴿فاخرجنا به ثمرات مختلفا الوانها﴾ ئینجا میوەجاتی جۆراو جۆرمان پێ بەرهەم هێنا؟ ﴿ومن الجبال جدد بیض وحمر مختلف الوانها وغرابیب سود﴾ ولەکێوەکانیش,شاخی سپیی وسوورو, ڕەشی تـۆخ - هـاوڕێ لەگـەڵ جیاوازی رەنگیانـدا - دروستکرد. دیارە هەرکەسێك ژیرو فامیدە بێت، ئەوانە گشت ئەکاتە بەڵگەی بەیەك زانینـی خـواو دەسـەڵاتی فراوان وبێسنووری ئەو، بەڵێ سەرنجدان و ووردبونەوە لەچیاکان بەوهەموو رەنگە جیاوازەیانەوە، ئەوسا بەرزیی ونرمیی وگەلییەکانیان، بێسۆ سەرمان پێدادەنوێنێ لەبەردەم بەدیهێنەرەکەیدا. ﴿[٢٨] ومن الناس والدواب والأنعام مختلف الوانه﴾ وە لەمەردم و جانەوەرو پاتاڵیشدا- واتە:وشترو بزن و مەڕوگا- جۆرێکی زۆری رەنگاو رەنگ هـەن: رەش پێس، سوور پێس،گەنمڕەنگ و هەتد، ئەمانە هـەموو بەڵگەی دەسـەڵات وتوانـایی خـوای جیهانەکانە، واتە:لە ناو خەڵکیشـدا هـەمووجۆرە مرۆڤێکـی رەنـگ وزمـان لێکجـودا، عەشیرەت وهـۆزو بنەماڵـە جـودا, دەبینـی, ئایـەتی: (.. واختلاف السنتكم والوانكم إن فیذلك لآیات للعالمین) ٢٢/٣٠. بـۆ سـەرنج راکێشـان و وردبوونەوەیـە لـەو گشـت دروستکراوانەی خوا ﴿كذلك﴾ واتە: جیاوازی کێوەکان ومیوەکان وایە لە جیوازی رەنگەکاندا , بەڵێ ئەو دەسـەڵاتە جێگەی بیر لێکردنەوەو رێز دانانە بۆ خاوەنەکەی و هەقە لێی بترسین و شـەرمی لێبکەین, وەکو دەفەرموێ: ﴿إنما یخشی الله من عباده العلماء﴾ بەراستی لە بەندەکانی خـوادا ,هـەر زاناکانن لە خوا ئەترسن و سەری نەوازشی بۆ دائـەنوێنن, چـونکە هـەر ئـەوان دەزانـن ئەوزاتەیـە چ خـاوەن دەسـەڵاتێکە، (ئـیبن عـەباس) دەڵـێ: زانـای خوانـاس: ئەوکەسـەیە کە هـیچ شـتێ نـەکا بەهاوبـەش بـۆ خـواو، حەڵاڵی ئەو بە حـەڵاڵ بزانـێ و، حەرامێشـی بەحـەرام دانـێ، وەسیەت و سپاردەکانیشـی بپارێزێ وچاوەڕوانی هـاتنی رۆژی دوایـی و دیـداری ئەو بێـو خـۆی بۆئامـادە بکـات. (سەعیدی کوڕی جوبەیر)یش دەڵێ: زانا هەر ئەو کەسەیە کە بەنهێنی لەخوا بترسـێ و، روو لەهـەر شـتێ وەرگێڕێ، کە خوا رووی لێوەرگێڕاوە. (ئیبن مەسعود) دەڵێ: زۆریی زانست بەقسەی زۆرو بۆر نییە، بەڵکو زانست: هەر لەخوا ترساندنە بەزۆریی. (مالیك) دەڵـێ: زانیاریی بە (ڕیوایەتی) زۆر نیـیە، بـەڵکوو نـوورو رووناکیـیەکە، خـوا خـۆی دەیخاتە دڵەوە. ﴿إن الله عزیز غفور﴾ بێگومان خوا دەسەڵاتدارە ,هەر شتێ بیەوێ ئەیکات, تاوانپۆش و لێبوردەیـە ﴿[٢٩] إن الذین یتلون كتاب الله﴾ بەڕاستیی ئەوانەی کە نامەی خوا "قورئان" ئەخوێننەوە ﴿واقاموا الصلاة﴾ نوێـژی ڕێك وپێك ئەکەن ﴿وانفقوا مما رزقناهم سرا وعلانیة﴾ و لـەو رۆزییـەی پێمـان داون بەنهێنی وبەئاشکرا ئەبەخشن ﴿یرجون تجارة لن تبور﴾ بەئومێدی بازرگانییەکن کە هـەرگیز لـە برەو ناکەوێ ﴿[٣٠] لیوفیهم اجورهم ویزیدهم من

فضله﴾ تا خوای گەورە لەبەرامبەر هەوڵەکانیان بەتێرو تەسەلی پاداشتیان بداتەوەو لەبەهرەی خۆی زیدەشیان بداتێ ﴿إنه غفور شکور﴾ چونکە بەڕاستیی ئەو خەتاپۆش و لێبوردەیە، پێزان و پاداشت دەرەوەیە ﴿[٣١] والذی أوحینا إلیك من الکتاب هو الحق﴾ وەئەوەی لەم کتێب وقورئانەدا وەحیمان بۆ کردویت , ئەوە هەق و ڕاستە ﴿مصدقا لما بین یدیه﴾ ددانیش بەو کتێبانەدا ئەنێ لەپێش خۆیەوە نێردراون ,وەك (تەورات) و (ئینجیل). ﴿إن الله بعباده خبیر بصیر﴾ بێگومان خوا بەبەندەکانی خۆی بەئاگاو بینایە.

**قورئان میراتی ئەم سێ تاقمەیە:**

﴿[٣٢] ثم اورثنا الکتاب الذین اصطفینا من عبادنا﴾ لەپاشان ئەم قورئانەمان کردە میرات و کەلەپوور بۆ ئەو بەندانەمان کە هەڵمان بژاردن، بەڵێ... ئەم ئوممەتی پێغەمبەرە ﷺ چاکترین گەلی هەڵبژێرراوە، هەر بۆیەش ئەم قورئانە دوای پەیامبەر ﷺ دراوەتە دەستی ئەوان ﴿فمنهم ظالم لنفسه﴾ ئینجا ئەوانە سەبارەت بە قورئان ئەبنە سێ بەشەوە: هەندێکیان - بەقسوورو کەمتەر خەمیکردن لە کار پێکردنیدا- ستەم لە خۆ ئەکەن.قسەی ڕاستیش ئەوەیە کە ئەوانە لەم ئوممەتەن ﴿ومنهم مقتصد﴾ برێکیشیان مامناوەندین , واتە: نەکەمتەر خەمی دەکەن و نەزیادە ڕەویش ﴿ومنهم سابق بالخیرات بإذن الله﴾ هەندێکیشیان - بەفەرمانی خوا- لە ئەنجامدانی کارە چاکەکاندا پێشکەوتوون، (تەبەرانیی) ئەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ((کلهم من هذه الأمة)) واتە: ئەو سێ دەستە هەر هەموویان لەم ئوممەتەن. ﴿ذلك هو الفضل الکبیر﴾ ئائەو میرات و کەلەپوورەیە فەزڵ و بەهرە گەورەکە, یان ئەو فەزڵە گەورەیە: ﴿[٣٣] جنات عدن یدخلونها﴾، بەهەشتەکانی مانەوەن تێیدەچن و, بەهەتاهەتاییش تێیدا دەبن ﴿یحلون فیها من أساور من ذهب ولؤلؤا﴾ لەناویاندا خشڵ پۆش دەکرێن بە بازنی زێڕو مرواری ﴿ولباسهم فیها حریر﴾ و جل و بەرگیشیان لەوێدا ئاوریشمە ﴿[٣٤] وقالوا الحمد لله الذی أذهب عنا الحزن﴾ شوکرانەی خوا دەکەن و ئەڵێن: سوپاس و ستایش بۆ ئەوخوایەیکە خەفەت و دڵ نیگەرانی لەسەر نەهێشتین ﴿إن ربنا لغفور شکور﴾ بێگومان پەروەردگارمان زۆر گوناح بەخشە، پێزان وپاداش دەرەوەیە ﴿[٣٥] الذی أحلنا دار المقامة من فضله﴾ ئەو خوایەی کە ئێمەی لە چاکەی خۆی لە ماڵی مانەوەونەفەوتاندا (واتە: لە بەهەشتدا)جێنشینکرد ﴿لا یمسنا فیها نصب ولا یمسنا فیها لغوب﴾ تێیدا هیچ ماندویەتی و خەستەگیمان پێناگات.

الجزء الثاني والعشرون سُورَةُ فَاطِرٍ

وَٱلَّذِيٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ هُوَ ٱلۡحَقُّ مُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ
يَدَيۡهِۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِعِبَادِهِۦ لَخَبِيرُۢ بَصِيرٞ ٣١ ثُمَّ أَوۡرَثۡنَا ٱلۡكِتَٰبَ
ٱلَّذِينَ ٱصۡطَفَيۡنَا مِنۡ عِبَادِنَاۖ فَمِنۡهُمۡ ظَالِمٞ لِّنَفۡسِهِۦ وَمِنۡهُم
مُّقۡتَصِدٞ وَمِنۡهُمۡ سَابِقُۢ بِٱلۡخَيۡرَٰتِ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ هُوَ
ٱلۡفَضۡلُ ٱلۡكَبِيرُ ٣٢ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ يَدۡخُلُونَهَا يُحَلَّوۡنَ
فِيهَا مِنۡ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٖ وَلُؤۡلُؤٗاۖ وَلِبَاسُهُمۡ فِيهَا حَرِيرٞ ٣٣
وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِيٓ أَذۡهَبَ عَنَّا ٱلۡحَزَنَۖ إِنَّ رَبَّنَا لَغَفُورٞ
شَكُورٌ ٣٤ ٱلَّذِيٓ أَحَلَّنَا دَارَ ٱلۡمُقَامَةِ مِن فَضۡلِهِۦ لَا يَمَسُّنَا
فِيهَا نَصَبٞ وَلَا يَمَسُّنَا فِيهَا لُغُوبٞ ٣٥ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَهُمۡ
نَارُ جَهَنَّمَ لَا يُقۡضَىٰ عَلَيۡهِمۡ فَيَمُوتُواْ وَلَا يُخَفَّفُ عَنۡهُم مِّنۡ
عَذَابِهَاۚ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي كُلَّ كَفُورٖ ٣٦ وَهُمۡ يَصۡطَرِخُونَ
فِيهَا رَبَّنَآ أَخۡرِجۡنَا نَعۡمَلۡ صَٰلِحًا غَيۡرَ ٱلَّذِي كُنَّا نَعۡمَلُۚ
أَوَلَمۡ نُعَمِّرۡكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ وَجَآءَكُمُ ٱلنَّذِيرُۖ
فَذُوقُواْ فَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ ٣٧ إِنَّ ٱللَّهَ عَٰلِمُ
غَيۡبِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ٣٨

هُوَ ٱلَّذِي ٤٣٨

**زۆرە زۆری خوانەناسان لە دۆزەخدا:**

﴿[٣٦] والذين كفروا لهم نار جهنم﴾ بۆ ئەوکەسانە کە کافرو بێ باوەڕن، ئاگری دۆزەخ هەیە ﴿لا يقضى عليهم
فيموتوا﴾ بڕیاری مردنیان بۆ نادرێ تا بمرن و لەو سزایە ڕزگار ببن ﴿ولا يخفف عنهم من عذابها﴾ شتێکیش
لەسزای دۆزەخیان لێ سووك ناکرێ ﴿كذلك نجزي كل كفور﴾ هەر ئابەوجۆرەیە- وەك ئەوانە- هەموو بێبڕوایەك
سزا ئەدەین ﴿[٣٧] وهم يصطرخون فيها﴾ وە لە دۆزەخدا بەزۆرە زۆر هاوارئەکەن ﴿ربنا اخرجنا نعمل صالحا غير
الذي كنا نعمل﴾ و ئەڵێن: پەروەردگارمان! لەم سزایە بمانهێنەدەرێ تا ئەمجارە کارێکی چاك ئەنجام بدەین، جگە
ئەوەی پێشتر دەمانکرد ،ئیتر ئەو دەمە بڕوا دێنین و گوێڕایەڵی ئەکەین ﴿اولم نعمركم ما يتذكر فيه من تذكر﴾ پێیان
ئەوترێ: ئەرێ ئێمە ئەوەندە تەمەنی درێژمان پێنەدان کە
هەرکەسێك ژیرو وریا بوایە لەو ماوەیەدا بیربکاتەوە،
دەیتوانی پەندو کەڵکی لێ وەرگرێت؟ ﴿وجاءكم النذير﴾ و
لەهەمانکاتدا ترسێنەریشمان نەهاتە لاتان بتان ترسێنێ بە
سزا؟ ئادەی چ سوودێکی بوو بۆتان؟ ﴿فذوقوا فما للظالمين
من نصير﴾ سزای ستەمەکەتان بچێژن، خۆ
بۆستەمکارانیش هیچ یارمەتیدەرێك نیە ،بەتایبەت ئەمڕۆ
﴿[٣٨] إن الله عالم غيب السموات والأرض﴾ بە ڕاستیی خوا
زانای پەنهان و نادیاری ئاسمانەکان و زەوییە ﴿إنه عليم
بذات الصدور﴾ بەڕاستیی ئەو لەنهێنی هەموو دڵێك
بەئاگایە ، ئەزانێ چییان تێدا شاراوەتەوە ﴿[٣٩] هو الذي
جعلكم خلائف في الأرض﴾ ئەوە ئەو خوایەیە ئێوەی
بەجێگرو جێنشینی پێشینەکانتان لەم زەویە داناوە،
خەڵکێکی زۆری لە ناوبردووە، وەك عادو سەمود.. ئەمڕۆش
ئێوە بوونە جێنشینیان ﴿فمن كفر فعليه كفره﴾ جا هەر
کەسێك کافرو بێبڕوا بێ، ئەوە تاوان و گوناهی کوفرەکەی
لەسەرخۆیەتی ﴿ولا يزيد الكافرين كفرهم عند ربهم إلا
مقتا﴾ بێبڕوایی بێ بڕوایانیش بۆیان زیاد ناکا لای پەروەردگاریان، بوغزو تووڕەیی نەبێت ﴿ولا يزيد الكافرين
كفرهم إلا خسارا﴾ و بێ ئەمەکی بێ ئەمەکان ،زیاد ناکا، زیان نەبێ ﴿[٤٠] قل ارايتم شركاءكم الذين تدعون من دون
الله﴾ بڵێ: هەواڵی هاوبەش و خواکانتانم بدەنێ، کە لەباتی خوا هاواریان بۆ ئەبەن و ئەیانپەرستن؟ ﴿اروني ماذا
خلقوا من الأرض﴾ نیشانم بدەن چییان لە زەوییدا دروستکردووە؟ تائێوە بیانپەرستن ﴿أم لهم شرك في السموات﴾
یا بەشدارییەکیان کردووە لەدروستکردنی ئاسمانەکاندا؟ ﴿أم آتيناهم كتابا فهم على بينة منه﴾ یا خێر نامەیەکم
پێداون کە ئەوان لەسەر بەڵگەیەك بن؟ ﴿بل إن يعد الظالمون بعضهم بعضا إلا غرورا﴾ نەخێر، وانیە.. ستەمکارەکان
هەر بەڵێنی فریودان وخەڵەتاندن بەیەك دەدەن گەورەو ئاغاکان بە نۆکەرەکانیان دەگوت: ئێمە تکاتان بۆ ئەکەین و
ئەوانیش وە دوویان کەوتن!

الجزء الثاني والعشرون — سورة فاطر

هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ فِي ٱلْأَرْضِۚ فَمَن كَفَرَ فَعَلَيْهِ كُفْرُهُۥۖ وَلَا يَزِيدُ ٱلْكَٰفِرِينَ كُفْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ إِلَّا مَقْتًاۖ وَلَا يَزِيدُ ٱلْكَٰفِرِينَ كُفْرُهُمْ إِلَّا خَسَارًا ﴿٣٩﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ شُرَكَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَرُونِي مَاذَا خَلَقُوا۟ مِنَ ٱلْأَرْضِ أَمْ لَهُمْ شِرْكٌ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَمْ ءَاتَيْنَٰهُمْ كِتَٰبًا فَهُمْ عَلَىٰ بَيِّنَتٍ مِّنْهُۚ بَلْ إِن يَعِدُ ٱلظَّٰلِمُونَ بَعْضُهُم بَعْضًا إِلَّا غُرُورًا ﴿٤٠﴾ ۞ إِنَّ ٱللَّهَ يُمْسِكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ أَن تَزُولَاۚ وَلَئِن زَالَتَآ إِنْ أَمْسَكَهُمَا مِنْ أَحَدٍ مِّنۢ بَعْدِهِۦٓۚ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا ﴿٤١﴾ وَأَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ لَئِن جَآءَهُمْ نَذِيرٌ لَّيَكُونُنَّ أَهْدَىٰ مِنْ إِحْدَى ٱلْأُمَمِۖ فَلَمَّا جَآءَهُمْ نَذِيرٌ مَّا زَادَهُمْ إِلَّا نُفُورًا ﴿٤٢﴾ ٱسْتِكْبَارًا فِي ٱلْأَرْضِ وَمَكْرَ ٱلسَّيِّئِۚ وَلَا يَحِيقُ ٱلْمَكْرُ ٱلسَّيِّئُ إِلَّا بِأَهْلِهِۦۚ فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا سُنَّتَ ٱلْأَوَّلِينَۚ فَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَبْدِيلًاۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَحْوِيلًا ﴿٤٣﴾ أَوَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِي ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَكَانُوٓا۟ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةًۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعْجِزَهُۥ مِن شَيْءٍ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِي ٱلْأَرْضِۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَلِيمًا قَدِيرًا ﴿٤٤﴾

٤٣٩

بتەکان دەتوانن چی بکەن؟:

﴿٤١ إن الله یمسك السموات والأرض أن تزولا﴾ بەڕاستیی خوا ئاسمانەکان و زەویی ڕاگرتووە تا لە گێرە ژنە دەر نەچن ﴿ولئن زالتا إن أمسکهما من أحد من بعده﴾ وە ئەگەر بترازابان لەیەك، لەپاش ئەو کەسێکیتر نەبوو ڕاگیریان کا، واتە: ئەگەر خوا تۆزقاڵێك دەستیان لێ بەربدات، ئەو یاسا سەرسوڕ هێنەرەیان تێك ئەچێ و کەسێکیش نیە نەهێڵێ ﴿إنه کان حلیما غفورا﴾ بەڕاستیی ئەو زۆر لەسەر خۆیە ،پەلە ناکات بۆ سزادان، زۆریش خەتا پۆش و لێبووردەیە ﴿٤٢ وأقسموا بالله جهد أیمانهم﴾ وە قوڕەیش بەهەرچی هێزیان بوو سوێندیان بەخوا دەخوارد ﴿لئن جاءهم نذیر﴾ کە ئەگەر ترسێنەر (پەیامبەر)ێك بێتە لایان ﴿لیکونن أهدی من إحدی الأمم﴾ بێگومان پتر لە هەر ئوومەتێکیتر ڕێنوێن دەبین، واتە: لە جوولەکەو فەلە و ئاگر پەرست. قورەیش نەفرینیان ئەکرد لەو دوو تیرەیە کە چۆن پەیامبەریان بۆ ڕۆیشتووە و سەرپێچیان کردووە، وە ئەیان وت: ئەمە سوێندی بێ ئەگەر بۆ ئێمە هاتبا، وامان نەدەکرد ﴿فلما جاءهم نذیر﴾ جا کاتێ ترسێنەرێك هاتە لایان هەر لەخۆیشیان وپێغەمبەریشبوو ﴿ما زادهم إلا نفورا﴾ هاتنەکەی بۆی زیاد نەکردن ،دوور دەکەوتنەوە نبێ لە هەق!! ﴿٤٣ استکباراً فی الأرض ومکر السیئ﴾ لەبەر خۆ بەزلزانین لەزەوییدا و، فرت وفێڵ وپلانکردن دژ بە پێغەمبەر ﴿ولا یحیق المکر السیئ إلا بأهله﴾ دەرەنجامی فرت وفێڵیش هەر بەسەر خاوەنەکەیدا دەشکێتەوەو زیان دەگەیەنێ ﴿فهل ینظرون إلا سنة الأولین﴾ دەئایا جگە لەچارەنووسی پێشینەکان، چاوەڕوانی چی دی دەکەن؟ کەواتە: چۆن ئەوان تیا چوون، بێگومان ئەمانیش ئەبێ تیا بچن ﴿ولن تجد لسنة الله تحویلا﴾ ئەمە باوی خوایە، قەتیش نابینی ئاڵ وگۆڕێك هەبێ بۆ باوو سوننەتی خوا.

دەرەنجامی بەدرۆ زنکردنی پێغەمبەران:

﴿٤٤ أو لم یسیروا فی الأرض فینظروا کیف کان عاقبة الذین من قبلهم﴾ ئاخۆ ئەوانە گەشتیان بەزەوییدا نەکردوو نەگەڕان ،تسەیر بکەن و بزانن: پاشە ڕۆژی ئەو گەلە یاخییانە کە لەپێشیانەوە بوون چۆن بوو؟ ﴿وکانوا أشد منهم قوة﴾ وە ئەوان لەمانیش بەهێزترو بە دەسەڵات تر بوون ﴿وما کان الله لیعجزه من شئ فی السموات ولا فی الأرض﴾ و هەرگیز هیچ شتێ لەناوئاسمانەکان و زەوییدا ناتوانێ لەژێر دەسەڵاتی ئەو دەرچێت ﴿إنه کان علیما قدیرا﴾ بەڕاستیی ئەوە،خوای زۆر زانا، زۆر توانا ﴿٤٥ ولو یؤاخذ الله الناس بما کسبوا﴾ ئەگەر ئەو خەڵکەی بەهۆی ئەوکارە ناپەسەندانەوە دەیانکەن، خوا بیگرتبان و تۆڵەی لێ سەندبان ﴿ما ترك علی ظهرها من دابة﴾ ئەودەمە لەسەر پشتی ئەم زەوییە هیچ ڕەوەندو گیانلەبەرێکی نەدەهێشتەوە، بەڵکو هەمووی لەناو دەبردن ﴿ولکن یؤخرهم إلی أجل مسمی﴾ بەڵام بۆ ماوەیەکی دیاریکراو سزایان دوا دەخات ، واتە: هەتا قیامەت دێت ﴿فإذا جاء أجلهم﴾ ئینجا کاتی کۆتایی ئەو ماوە دیاریکراوەهات ، هەرەیەکەیان بەپێی کردەوەی خۆی پاداشت و تۆڵە ئەدرێتەوە ﴿فإن الله کان بعباده بصیرا﴾ جا بەڕاستیی خوا بەبەندەکانی خۆی هەمیشە بینایە، چاك ئەزانێ چی ئەکەن، و چی هەڵئەگرن.

کۆتایی تەفسیری سوورەتی (فاتیر)، زۆریش سوپاس بۆخوای بالآدەست.

*** *** ***

## ٣٦- سوورەی ( یاسین )ـە

## مەککەییەو ( ٨٣ ) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتە مەککەیی یە، ئایەتی (وما تأتيهم من آية من آيات ربهم إلا كانوا عنها معرضين) نەبێ، دوای سورەتی (جن)یشەوە هاتووە، چەسپاندنی چەند مەبەستێکی گرنگی تێدایە:

یەکەم: موحەممەد ﷺ بێ هیچ گومانێك پێغەمبەرو نێرراوی خوایە،.

دووەم: ئەوانەی بانگ دەکرێن وئەترسێنرێن لەلایەن پەیامبەرانەوە دەبنە دوودەستە: دەستەیەکیان هەرگیز گوێ بیست نابن وخێرنادەنەوە، ئەو دەستەکەی تریشیان خۆی هەوڵدەداو تێدەکۆشێ بەختەوەربێ.

سێ یەم: کاروکردەوەی هەردوولاشیان بۆیان هەڵئەگیرێ وئاسەوارو شوێنەواری چاك وخراپیشیان بۆئەنووسرێ.

چوارەم: سەلماندن وچەسپاندنی زیندووبوونەوە بەچەندین بەڵگەو نیشانە. ئیمامی (ترمزیی) ئەم فەرموودەیە - ئەگەرچی لاوازیش بێت - لەبارەی فەزڵ وگەورەیی ئەم سوورەتەوە هێناوە: ((إن لكل شئ قلبا، وقلب القرآن يس، ومن قرأ (يس) كتب الله له بقراءتها، قراءة القرءان عشر مرات)). بەکورتیی: هەموو شتێ دڵ وناوەرۆکێکی هەیە، سوورەتی (یاسین)یش دڵی قورئانە، هەرکەسێك بیخوێنێ، وەك ئەوە دەجار دەوری قورئانی کردبێتەوە. هەندێ لەزانایان دەڵێن: لەتایبەتمەندی ئەم سوورەتەیە کە بۆهەر گرفت وکارێکی ئاڵۆز بخوێنری، خوا ئاسانیدەکا. ئیمامی(ئیبن کەسیر) دەڵێ: وائەزانم بۆیە لەلای نەخۆشێ کە لە گیانەلاندابێ دەخوێنرێ، چونکە لەکاتی خوێندنیدا رەحمەت وبەرەکەت دێتە خوارێ و، بەئاسانیش گیانی مردووەکە دەردەچێ. پێشەوا (ئەحمەد) دەڵێ: مامۆستا بەرێزەکان دەڵێن: خوێندنی (یس) دەبێتە بار سووکی بۆمردووەکە. (ئیبن عەباس) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((لوددت انها في قلب كل إنسان من أمتي)) أخرجه الحافظ البزار/ باب فضائل القرآن/. گەلێ پێم خۆشەکە هەمووکەسێك لەئوممەتم سوورەتی یاسین لە بەر بکاو لەنێودڵیا جیێبکاتەوە.

الجزء الثاني والعشرون | سُورَةُ يسٓ

وَلَوۡ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِمَا كَسَبُواْ مَا تَرَكَ عَلَىٰ
ظَهۡرِهَا مِن دَآبَّةٖ وَلَٰكِن يُؤَخِّرُهُمۡ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗىۖ
فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِعِبَادِهِۦ بَصِيرَۢا (٤٥)

سُورَةُ يسٓ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
يسٓ (١) وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡحَكِيمِ (٢) إِنَّكَ لَمِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ (٣) عَلَىٰ
صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ (٤) تَنزِيلَ ٱلۡعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ (٥) لِتُنذِرَ قَوۡمٗا مَّآ
أُنذِرَ ءَابَآؤُهُمۡ فَهُمۡ غَٰفِلُونَ (٦) لَقَدۡ حَقَّ ٱلۡقَوۡلُ عَلَىٰٓ أَكۡثَرِهِمۡ
فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ (٧) إِنَّا جَعَلۡنَا فِيٓ أَعۡنَٰقِهِمۡ أَغۡلَٰلٗا فَهِيَ إِلَى
ٱلۡأَذۡقَانِ فَهُم مُّقۡمَحُونَ (٨) وَجَعَلۡنَا مِنۢ بَيۡنِ أَيۡدِيهِمۡ سَدّٗا
وَمِنۡ خَلۡفِهِمۡ سَدّٗا فَأَغۡشَيۡنَٰهُمۡ فَهُمۡ لَا يُبۡصِرُونَ (٩) وَسَوَآءٌ
عَلَيۡهِمۡ ءَأَنذَرۡتَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تُنذِرۡهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ (١٠) إِنَّمَا تُنذِرُ
مَنِ ٱتَّبَعَ ٱلذِّكۡرَ وَخَشِيَ ٱلرَّحۡمَٰنَ بِٱلۡغَيۡبِۖ فَبَشِّرۡهُ بِمَغۡفِرَةٖ
وَأَجۡرٖ كَرِيمٍ (١١) إِنَّا نَحۡنُ نُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰ وَنَكۡتُبُ
مَا قَدَّمُواْ وَءَاثَٰرَهُمۡۚ وَكُلَّ شَيۡءٍ أَحۡصَيۡنَٰهُ فِيٓ إِمَامٖ مُّبِينٖ (١٢)

وَٱضۡرِبۡ لَهُم | ٤٤٠

### کاری پێغەمبەر ترساندنە:

﴿بسم الله الرحمن الرحيم * [١] يس﴾ بە: (یا، سین) ئەخوێنرێتەوەو، قسەی ڕاستیش دەربارەیان ئەوەیە کە ئەمانیش هەرلەو پیتە بچڕ بچڕانەن و، (تەحەددی) عەرەبەکان دەکەن وپێیان دەڵێن: ئەگەر ئێوە گومانێکتان هەیە لەم قورئانەدا، دەسا ئێوەش وەك سوورەتێکی بێنن ﴿[٢] والقرآن الحكيم﴾ سوێند بەقورئانێك کە ئایەتەکانی گشت

تابت و نەگۆڕاون و، بڕیارەکانیشی ئاشکراو بەجێن ﴿٣ إنك لمن المرسلين﴾ بێگومان تۆ - ئەی موحەممەد ﷺ- یەك لەپەیامبەرانیت، با قورەیش هەر بۆخۆیان بڵێن. سوورەتی (٤٣/١٣): (ويقول الذين كفروا لست مرسلا) وە سوورەتی (٢/٢٥٢): (.. وإنك لمن المرسلين) هەر پشتگیری ئەو مانایەن. ﴿٤ على صراط مستقيم﴾ لەسەر ڕێی و ڕێبازێکی راست و دروست و ڕێکیت ﴿٥ تنزيل العزيز الرحيم﴾ ئەم قورئانەش هەر خوایەکی زاڵ وبەدەسەڵات و میهرەبان ناردوویەتی. ﴿٦ لتنذر قوما ما انذر آباؤهم﴾ تا خەڵکێك بترسێنی، کە باووباپیرانیان نەترسێنراون لە لایەن هیچ پێغەمبەرێکەوە، نەپێش عیساو،نەدوای عیسا ﴿فهم غافلون﴾ جا بەوهۆیەوە غافڵ وبێ ئاگان لەبەرنامە ئاسمانیەکان. ئایەتی (١٧/١٥): (وما كنا معذبين حتى نبعث رسولا..) هەر ئەو مانایە ڕوون ئەکاتەوە. ﴿٧ لقد حق القول على اكثرهم فهم لا يؤمنون﴾ بەڕاستیی فەرمان وتۆڵەی خوا بەهۆی لاساریی خۆیانەوە لەسەر زۆرێکیان بەدی هات، ئینجا ئەوانیش بڕوا ناهێنن. سوورەتی (٤١/٢٥)، (٢٨/٦٣)، (٦٣/٧٠)، (٣٧/٣١)، (٩٧/٩٦/١٠)، (٣٩/٧١)، (١١ /١١٩)، (١١/١١٨-١١٩)، (٣٢/١٣)، (٣٨/ ٨٤/٨٥) گشتیان جۆرە تەفسرێکن بۆ ئەوئایەتەی: (لقد حق القول على آثرهم..). سوورەتی: (١١/١٧)، (١٢/١٠٣)، (٣٧/٧١)، (٢٦/ ١٧٤)، (٦/١١٦) دووپاتی ئەکەنەوە کە بەشێکی زۆر لە خەڵك جەهەنەمیین، وە لەفەرموودەی راست و ڕەوایشدا هاتووە: ((إن نصيب النار من الألف تسعة وتسعون وتسعمأة، وإن نصيب الجنة منها واحد)). کە هەر لەهەزار کەسدا (٩٩٩)یان بەشی ئاگرن و! تەنها یەکێکیان بەهەشتی دەبێ! هەر ئەم مانایە ئیمامی (بوخاریی)یش هێناویەتی: ((من كل الف تسعمأة وتسعة وتسعون..)).

**ئەمە حاڵی بەدکارانە:**

﴿٨ إنا جعلنا فى أعناقهم أغلالا﴾ بێگومان ئێمە زنجیر دەخەینە ملیان وهەردوودەستیان ﴿فهى إلى الأذقان فهم مقمحون﴾ ئەوساهەتا چەناکەیان شەتەك دەدەین، ئیتر سەریان بەرز رادەوەستێ وناتوانن بەهیچ لایەکدا بیجوڵێنن و ڕێگەی راست نابینن. مەبەست ئەوەیە ئەوانە چۆن مرۆڤێك هەردوودەستی ببەسترێ بە مل وگەردنی خۆیەوە ئیتر ناتوانێ سەر دانەوێنێ و، ڕێگە ببینێ" ئەوانیش بەهۆی لاساری خۆیانەوە دوورخراونەتەوە لەڕێگەی راست ﴿٩ وجعلنا من بين أيديهم سدا ومن خلفهم سدا﴾ لەمپەرێکمان لەبەردەم ولەپشت یانەوە داناوە ﴿فأغشيناهم فهم لا يبصرون﴾ جابەوهۆیەوە تارمایی چاویانیشمان داپۆشی وپەردەمان هێنا بەسەریاندا،ئینجا پاش و پێشی خۆیان نابینن. بۆ ئەم پەردە هێنانە بەسەر چاویانداو ڕێدەرنەکردنەیان لە (٢/٧)،(٤٥/٢٣)دا. ئاماژەی پێکراوە مەبەست ئەوەیە کە هەر لەئەزەلدا پەروەردگار پێی زانیون ئەوانە لاسارو لاڕێ ئەبن هەرچەندە بەڵگەیان بۆ بهێنرێتەوە باوەڕ ناهێنن، بۆیە ئەویش هەر لە (لوح المحفوظ)دا بڕیاری خۆی لەسەر داون، هەر وەکو ئەم سوورەتی (یس)ـە دەفەرمووێ: (لقد حق القول على اكثرهم فهم لا يؤمنون) هەروا سوورەتی: (١٨/٥٧). (٢/٧). (٤٥/٢٣)، (٦/١٢٥)، (٧/١٨٦)، (٥١/٤١)، (١٦/١٠٨)، (١١/٢٠)، (١٨/١٠١). خوای گەورە هۆی سزاومۆرنان بەسەر دڵیانداو زنجیر لەمل کردنیان دەگێڕێتەوە بۆ درێژە پێدانیان بە بێبڕوایی و سوور بوونیان لەسەر بێ بڕوایی: (٤/١٥٥)، (٦٣/٣)، (٦١/٥)، (٦/ ١١٠)، (٢/١٠). ﴿١٠ وسواء عليهم انذرتهم أم لم تنذرهم﴾ وە چ بیانترسێنی، چ نەیانترسێنی بۆ ئەوانە وەکو یەکە، واتە: خۆت ماندوو بکەیت لەگەڵیاندا، یان نا ﴿فهم لا يؤمنون﴾ ئەوان هەر بڕوا ناهێنن، چونکە ترساندن بۆئەوانە کەڵکی نابێ ﴿١١ إنما تنذر من اتبع الذكر﴾ ترس وەبەرهێنانەکەت تەنها بۆکەسێك کەڵکی دەبێ کە پەیڕەوی هەر لەقورئان بکات ﴿وخشى الرحمن بالغيب﴾ ولە نەدیدو پەنایشەوە لەخوای بەخشەرو بەبەزەیی بترسێت ﴿فبشره بمغفرة وأجر كريم﴾ ئینجا مژدەی لێبوردن وپاداشتێکی چاکی پێ بدە. جادوای ئەمە خوا باسی

زیندو وبوونەوە ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿[١٢] إنا نحن نحي الموتى﴾ بێگومان تەنها ئێمەین هەموو مردووان زیندوو ئەکەینەوە ﴿ونكتب ماقدموا وآثارهم﴾ و هەرکارێکیان پێشخۆ خستبێ تۆماری دەکەین وتەنانەتی ئاسەواریشیان گشت دەنووسین، واتە: هەر ڕێ و ڕەوشتێکیان بەجێ هێشتبێ چاك و خراپ بۆیان حسێب ئەکەین، بۆیە پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: (من سن في الإسلام سنة حسنة فله أجرها وأجر من عمل بها من بعده، من غير أن ينقص من أجورهم شيئا، ومن سن في الإسلام سنة سيئة كان عليه وزرها و وزر من عمل بها من بعده، من غير أن ينقص من أوزارهم شيئا) موسلیم. واتە: هەرکەسێ لە ئیسلامدا ڕێ و ڕەوشتێکی چاك دابمەزرێنێ، دیارە پاداشتی تایبەتی خۆی دەبێ، هاوڕێ لەگەڵ هەر کەسێکی دیکەش پاش ئەو کاری پێبکا" بەڵام بێ ئەوەی لە کرێ و پاداشی ئەوان شتێ کەم بکا، خۆئەگەر کەسێك ڕچەیەکی خراپی شکاندو خەڵکی وە دووی کەوتن، بێگومانە هەم گوناحی خۆیی و، هەم گوناحی شوێنکەوتووەکانیشی هەڵدەگرێت، بێ ئەوەی شتێك لە گوناحی ئەوان کەم بکاتەوە. ﴿وكل شئ احصيناه في إمام مبين﴾ هەموو شتێکمان لە کتێب و نامەیەکی ئاشکرادا ئامادەو تۆمارکردووە، واتە: لە (لوح المحفوظ)دا کە هیچ شتێکی تیاگومنابێت، هەموو شتێکی بچووك و گەورە وردو درشتمان ئەژماردووە.

**بەسەرهاتی خەڵکی ناو ئاوایی یەکەی (ئەنتاکییە):**

﴿[١٣] واضرب لهم مثلا أصحاب القرية﴾ تۆ ئەی موحەممەد ﷺ بەسەرهاتی خەڵکی گوندنشینەکانی (ئەنتاکی‌یە) بۆ قورەیش بگێڕەوە.

(قرية): هەرچەند لەبنەڕەتدا بە گوندو ئاوایی ئەڵێن، بەڵام هەموو گوندو شارو شارۆچکەیەك ئەگرێتەوە، بە تایبەتی لێرەدا مەبەست گوندیکە لە شام بەناوی (أنطاکیە)وەو ئێستاش شارێکە لە (سوریە)، کاتی خۆی بتپەرەستبوون وخواش سێ پێغەمبەری بۆناردوون. ﴿إذ جاءها المرسلون﴾ کاتێ پەیامبەرەکان چونە لایان , تا باسی یەکتاپەرستیی و زیندوو بوونەوەیان بۆبکەن. ﴿[١٤] إذ أرسلنا إليهم اثنين فكذبوهما﴾ ئەو دەمە ئێمە دووکەسمان ناردە لایان و، ئەوان بەدرۆیان خستنەوە وباوەڕیان پێنەکردن و﴿فعززنا بثالث﴾ ئێمەش پێغەمبەری سێیەممان ناردەلایان بۆ یارمەتی دوانەکەی پێش ﴿فقالوا إنا إليكم مرسلون﴾ جا هەموویان پێکەوە چوون و وتیان: بێگومان ئێمە نێرراوو پەیامبەری خواین بۆلای ئێوە , تا ڕێنموونیتان بکەین ﴿[١٥] قالوا ما انتم إلا بشر مثلنا﴾ کەچی لەوەڵامدا وتیان: ئێوەش مەگەر هەر مرۆڤ نین وەکو ئێمە؟ ئیتر ئەم قسانەتان لەچی‌یە؟! ﴿وما انزل الرحمن من شئ﴾ خوای بەخشندە لەو بارەوە هیچ نیگایەکی نەناردووە ﴿إن انتم إلا تكذبون﴾ ئێوە هەر درۆدەکەن وڕاست نیە کە دەڵێن نیگامان بۆکراوە لەلایەن خواوە ﴿[١٦] قالوا ربنا يعلم إنا إليكم لمرسلون﴾ پەیامبەرەکان وەڵامیان دانەوەو وتیان: پەروەردگاری ئێمە خۆی ئەزانێ کە بەڕاستیی

الجزء الثاني والعشرون — سورة يس

وَاضْرِبْ لَهُم مَّثَلًا أَصْحَابَ الْقَرْيَةِ إِذْ جَاءَهَا الْمُرْسَلُونَ ﴿١٣﴾
إِذْ أَرْسَلْنَا إِلَيْهِمُ اثْنَيْنِ فَكَذَّبُوهُمَا فَعَزَّزْنَا بِثَالِثٍ فَقَالُوا إِنَّا
إِلَيْكُم مُّرْسَلُونَ ﴿١٤﴾ قَالُوا مَا أَنتُمْ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا وَمَا أَنزَلَ
الرَّحْمَٰنُ مِن شَيْءٍ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا تَكْذِبُونَ ﴿١٥﴾ قَالُوا رَبُّنَا يَعْلَمُ إِنَّا
إِلَيْكُمْ لَمُرْسَلُونَ ﴿١٦﴾ وَمَا عَلَيْنَا إِلَّا الْبَلَاغُ الْمُبِينُ ﴿١٧﴾
قَالُوا إِنَّا تَطَيَّرْنَا بِكُمْ لَئِن لَّمْ تَنتَهُوا لَنَرْجُمَنَّكُمْ وَلَيَمَسَّنَّكُم
مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٨﴾ قَالُوا طَائِرُكُم مَّعَكُمْ أَئِن ذُكِّرْتُم
بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ مُّسْرِفُونَ ﴿١٩﴾ وَجَاءَ مِنْ أَقْصَى الْمَدِينَةِ رَجُلٌ
يَسْعَىٰ قَالَ يَا قَوْمِ اتَّبِعُوا الْمُرْسَلِينَ ﴿٢٠﴾ اتَّبِعُوا مَن
لَّا يَسْأَلُكُمْ أَجْرًا وَهُم مُّهْتَدُونَ ﴿٢١﴾ وَمَا لِيَ لَا أَعْبُدُ الَّذِي
فَطَرَنِي وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢٢﴾ أَأَتَّخِذُ مِن دُونِهِ آلِهَةً إِن
يُرِدْنِ الرَّحْمَٰنُ بِضُرٍّ لَّا تُغْنِ عَنِّي شَفَاعَتُهُمْ شَيْئًا وَلَا
يُنقِذُونِ ﴿٢٣﴾ إِنِّي إِذًا لَّفِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ ﴿٢٤﴾ إِنِّي آمَنتُ
بِرَبِّكُمْ فَاسْمَعُونِ ﴿٢٥﴾ قِيلَ ادْخُلِ الْجَنَّةَ قَالَ يَا لَيْتَ قَوْمِي
يَعْلَمُونَ ﴿٢٦﴾ بِمَا غَفَرَ لِي رَبِّي وَجَعَلَنِي مِنَ الْمُكْرَمِينَ ﴿٢٧﴾

٤٤١

ئێمە بۆلای ئێوە نێرراوین ﴿١٧ وما علينا إلا البلاغ المبين﴾ هەر ئەوەندەشمان لەسەرە کە پەیامە ئاشکراکەی ئەو بەئێوە رابگەیەنین، ئیتر بڕوا دێنن یان نە.. کەیفی خۆتانە. ﴿١٨ قالوا إنا تطيرنا بكم﴾ جا گوندنشینەکان کاتێ پەکیانکەوت وقسەیان نەما وتیان: ئێمە پێوقەدەمی ئێوە بەنەگبەت دەزانین ﴿لئن لم تنتهوا﴾ ئەوەی راستیی بێ ئەگەر کۆتایی بەم قسانەش نەهێنن ﴿لنرجمنكم﴾ دڵنیابن بەردە بارانتان ئەکەین ﴿وليمسنكم منا عذاب أليم﴾ و سزایەکی سەخت و دەردناکتان دەدەین ﴿١٩ قالوا طائركم معكم﴾ پەیامبەرەکان وتیان نەخێر ئێمە شووم و نەگبەت نین، بەڵکو شوم ونەگبەتی لەخۆتانەوەیە ﴿أئن ذكرتم﴾ ئاخۆ ئێوە ئامۆژگاریش بکرێن بۆ رێی بەختیاریی هەروا دەکەن!!؟ ﴿بل انتم قوم مسرفون﴾ نەخێر، وانیە وەك ئێوە پێتان وایە، بەڵکو ئێوە کۆمەڵ و گەلێکی زیادەرەوو لەسنوور دەرچوون ﴿٢٠ وجاء من أقصى المدينة رجل يسعى﴾ و پیاوێك لەوسەری شارەوە بەهەڵە داوان بۆلای خەڵکەکە هات، دوای ئەوەی بیستی کە دانیشتوانی شارەکە نیازیان خراپە لەگەڵ پەیامبەرەکاندا، (ئیبن عەبباس) دەڵێ: ئەو پیاوە پیاوێکی صالح وئاکارچاك و ناوی (حەبیب)ی (نەجار) بوو، جا پاش ئەوەی کە پەندو ئامۆژگاریەکی زۆری کردن شەهیدیان کرد! ﴿قال يا قوم اتبعوا المرسلين﴾ وتی: ئەی هۆزەکەم! بکەونە دوای ئەو پەیامبەرانە بۆلای ئێوە رەوانە کراون. ﴿٢١ اتبعوا من لا يسألكم اجرا﴾ پەیڕەوی ئەوانە بکەن کە، تەنانەت کەمێ کرێیشیان لێناوێن بۆ راگەیاندنی بەرنامەکەی خوا ﴿وهم مهتدون﴾ خۆیشیان شارەزاو رێنموونی کراون ، بۆرێی راست ﴿٢٢ وما لي لا أعبد الذي فطرني﴾ بۆ دەبێ من زاتێکیوا نەپەرستم کە دروستی کردوم ﴿وإليه ترجعون﴾ دەرەنجامیش هەمووتان هەر بۆلای ئەو دەهێنرێنەوە ﴿٢٣ أأتخذ من دونه آلهة﴾ ئایا دەبێ بێجگە لەوخوایە چەندخوایەکی تر بۆ خۆم هەڵبژێرم و بیانپەرستم؟! ﴿إن يردن الرحمن بضر لا تغن عني شفاعتهم شيئا ولا ينقذون﴾ ئەگەر خوای بەبەزەیی بیەوێ زیانێکم تووش بکات، تکاو لاڵەی ئەوان کەمترین سوودم پێناگەیەنن و،ناتوانن لەسزای ئەورزگارم بکەن، چونکە هیچیان بەدەست نییە ﴿٢٤ إني إذا لفي ضلال مبين﴾ جا ئەگەر لەباتی ئەوخوایە هەر پەرستراوێکی تر بپەرستم، بەراستی ئەو حەلە من لەگومڕایی یەکی ئاشکرادام ﴿٢٥ إني آمنت بربكم فاسمعون﴾ بەڕاستیی من بەپەروەردگاری ئێوە بڕوام هێنا، دەسا ئێوە ببیسن وئامۆژگارییەکەم وەرگرن ﴿٢٦ قيل ادخل الجنة﴾ جا دوای ئەوە کەپەلاماریان داو کوشتیان وبەرەولای خوا بەشەهیدی گەڕایەوە، پێی وترا: دەسا بچۆرە بەهەشتەوە لەپاداشی بانگەوازو بڕواکەتدا ﴿قال ياليت قومي يعلمون﴾ ئینجا پاش ئەوە چووە بەهەشتەوەو رەزامەندی خواو ئەو هەموو نازو نیعمەتەی دیت بۆی ئامادە کراوە، وتی: خۆزگایە هۆزەکەشم بییانزانیبا ﴿٢٧ بما غفرلي ربي وجعلني من المكرمين﴾ بەلێبوردنی پەروەردگارم بۆم و بە گێڕانم لەناو رێز گیراواندا، تا ئەوانیش باوەڕیان هێناباوکردەوەی باشیانکردبا.

کۆتایی جزمی بیست و دووەم

ولله الحمد و المنة.

*** *** ***

* ﴿٢٨ وما انزلنا على قومه من بعده من جند من السماء﴾ وپاش کوشتنی ئەو پیاوە موسڵمانە هیچ لەشکرێکمان نەنارده سەرهۆزەکەی لە ئاسمانەوە بۆ لەناو بردنیان،چونکە شایستەی ئەوە نەبوون تا لەشکرکەشییان بۆبکەین وپێویستیشی نەدەکرد ﴿وما كنا منزلين﴾ خۆ بەر لەمەش بۆ هیچ گەلێکمان نەناردووە، واتە: سوننەتمان نەبووە لەشکر بنێرین بۆ لەناو بردنی گەلانی یاخیی وملهووڕی وا، بەڵکو بەسزاو ئازار تیامان

بردوون, وەکو دەفەرموێ: ﴿[٢٩] إن كانت إلا صيحة واحدة فإذا هم خامدون﴾ تەنها هەریەك نەعرەتەو دەنگێك بوو,واتە: بە تەنهاجوبریل هات و قیڕاندی بەسەریاندا, لەناکا ئەوانیش هەموو لەجێی خۆیاندا مردن.

ڕاڤەکەرانی قورئان دەڵێن: خوا جوبریلی ناردودەرگای شارەکەی (ئەنتاکیە) ی لیگرتن و بانگێکی بە سامی بەسەرا دان، ئیتر ئەوسا تاکە کەسێکیان لێ دەرنەچوو، جێی باسە ئەوهۆزو گەلە تیاچووە خەڵکی(ئەنتاکیە)ی شام بوون کە ئێستا سەر بە (تورکیا)یە ,هەرچەندە (ئیبن کەسیر) چەند تێبینیەکی لەبارەی دیاریکردنی ئەو شارەوە هەیە!

**مەخابن بۆ بەندە درۆزنەکان! :**

﴿[٣٠] یا حسرة على العباد﴾ مەخابن، بۆ ئەوبەندانە(واتە:بۆ خەڵکەکەی ئەنتاکیە) کە پەیامبەرەکانیان بەدرۆزن زانی وئیمانیان نەهێنا، وەك ئەفەرموێ: ﴿ما يأتيهم من رسول إلا كانوا به يستهزئون﴾ هەر پەیامبەرێکیان بۆ نەدەهات, مەگەر گاڵتەیان پێدەکرد, ئێمەش لەناومان دەبردن ﴿[٣١] ألم يروا كما أهلكنا قبلهم من القرون﴾ ئایا قورەیش نەیانبینی کە خەڵکێکی زۆرمان لەگەلانی پێش ئەوان, قڕکردو لەناو برد, دەسا بۆعیبرەت وەرناگرن؟ ﴿أنهم إليهم لا يرجعون﴾ کەجارێکیتر هەرگیز ناگەڕێنەوەلایان ﴿[٣٢] وإن كل لما جميع لدينا محضرون﴾ وە بەڕاستیی هەموشیان لەرۆژی قیامەتدا بۆ پاداش وتۆڵە لای خۆمان ئامادە ئەکرێن, ئایەتی (وإن كلا لما ليوفينهم ربك أعمالهم..)١١/١١١. پشتگیری ئەوەدەکات.

**ئەم جیهانە بێ ( صانیع ) نابێ:**

﴿[٣٣] وآية لهم الأرض الميتة أحييناها﴾ وەنیشانەیەك بۆیان لەسەر زیندوو بوونەوە, زەوی مردووە, زیندوومان کردۆتەوە بەباران ﴿وأخرجنا منها حبا فمنه يأكلون﴾ ودانەوێڵەیەکمان لێ دەرهێناوە لێی ئەخۆن و پێیدەژین ﴿[٣٤] وجعلنا فيها جنات من نخيل وأعناب﴾ وەهەرلەو زەوییە مردووەدا, چەندین باخەخورماو, باخە ترێمان بەدیهێنا. خورماو ترێ دوو نیعمەتی خوان و بەخواردن ئەدرێنە قەڵەم, زانایان لەبارەیانەوە ئەڵێن: لەم دووجۆرە میوەیەدا چەند ڤیتامین -کە لەش و تەنی مرۆڤ پێویستیان پێیەتی- هەیە، ئەمە لە لایەکەوە، لەلایەکی تریشەوە ئەتوانین بڵێین لە تەواوی ساڵدا، یا بەتەڕو تازەو فەریکەیی، یان بە وشککراوەیی, بەئاسانی دەستدەکەون. ﴿وفجرنا فيها من العيون﴾ وە کانیاوێکی زۆرمان لیهەڵقوڵاند ﴿[٣٥] ليأكلوا من ثمره وما عملته أيديهم﴾ تا لەمیوەی ئەوخوایە بخۆن، کە دەستەکانی ئەوان پەیدای نەکردووە. (ئیبن عەباس) و (قەتادە) دەڵێن: بیژەی (ما) لەم ئایەتەدا بۆ (نەفیە), بۆیە ئێمەش بە (نەفی) مانامانکرد ﴿أفلا يشكرون﴾ دەئایا سوپاسگوزاریی ناکەن؟ ﴿[٣٦] سبحان الذي خلق الأزواج كلها﴾ پاك وخاوێنە ئەو خوایە کە لە هەموو شتێك- مرۆڤ، گوڵ وگیا، ئەتۆم و زەڕات - جووت ونێرو مێی دروستکرد. ﴿مما تنبت الأرض﴾ لەوەی زەویی ئەیڕوێنێ

الجزء الثالث والعشرون — سورة يس

وَمَآ أَنزَلْنَا عَلَىٰ قَوْمِهِۦ مِنۢ بَعْدِهِۦ مِن جُندٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا كُنَّا مُنزِلِينَ ﴿٢٨﴾ إِن كَانَتْ إِلَّا صَيْحَةً وَٰحِدَةً فَإِذَا هُمْ خَٰمِدُونَ ﴿٢٩﴾ يَٰحَسْرَةً عَلَى ٱلْعِبَادِ مَا يَأْتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٣٠﴾ أَلَمْ يَرَوْا۟ كَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّنَ ٱلْقُرُونِ أَنَّهُمْ إِلَيْهِمْ لَا يَرْجِعُونَ ﴿٣١﴾ وَإِن كُلٌّ لَّمَّا جَمِيعٌ لَّدَيْنَا مُحْضَرُونَ ﴿٣٢﴾ وَءَايَةٌ لَّهُمُ ٱلْأَرْضُ ٱلْمَيْتَةُ أَحْيَيْنَٰهَا وَأَخْرَجْنَا مِنْهَا حَبًّا فَمِنْهُ يَأْكُلُونَ ﴿٣٣﴾ وَجَعَلْنَا فِيهَا جَنَّٰتٍ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَٰبٍ وَفَجَّرْنَا فِيهَا مِنَ ٱلْعُيُونِ ﴿٣٤﴾ لِيَأْكُلُوا۟ مِن ثَمَرِهِۦ وَمَا عَمِلَتْهُ أَيْدِيهِمْ أَفَلَا يَشْكُرُونَ ﴿٣٥﴾ سُبْحَٰنَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَزْوَٰجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلْأَرْضُ وَمِنْ أَنفُسِهِمْ وَمِمَّا لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٦﴾ وَءَايَةٌ لَّهُمُ ٱلَّيْلُ نَسْلَخُ مِنْهُ ٱلنَّهَارَ فَإِذَا هُم مُّظْلِمُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱلشَّمْسُ تَجْرِى لِمُسْتَقَرٍّ لَّهَا ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ ﴿٣٨﴾ وَٱلْقَمَرَ قَدَّرْنَٰهُ مَنَازِلَ حَتَّىٰ عَادَ كَٱلْعُرْجُونِ ٱلْقَدِيمِ ﴿٣٩﴾ لَا ٱلشَّمْسُ يَنۢبَغِى لَهَآ أَن تُدْرِكَ ٱلْقَمَرَ وَلَا ٱلَّيْلُ سَابِقُ ٱلنَّهَارِ وَكُلٌّ فِى فَلَكٍ يَسْبَحُونَ ﴿٤٠﴾

٤٤٢

﴿ومن انفسهم ومما لا یعلمون﴾ و لە نەفسیخۆشیان، ولەو شتانەیش کە ئەوان نایزانن. بەڵێ.. لەم بوونەوەرەدا چەندان شتیتر هەیە کە تائێستاش مرۆڤ نایاندەزانێ.

**شەو و رۆژ, خۆرو هەیڤ, نیشانەی بوون و تاك و تەنیایی خوان:**

﴿ ٣٧ وآیة لهم اللیل نسلخ منه النهار﴾ شەویش نیشانەوبەڵگەیەکی ترە بۆیان کە ئێمە رووناکی خۆرو رۆژی لێ دەردەکێشین ﴿فإذا هم مظلمون﴾ جا لەناکاو شەو دێ ودەڕۆنە تاریکییەوە ﴿ ٣٨ والشمس تجری لمستقر لها﴾ و بەڵگەیەکیتر بۆیان خۆرە, کە بەردەوام دێت ودەچێ, تاکاتی دیاریکراوی خۆی بۆ راوەستان و لەکارکەوتن چێ دەبینی بەرەو بنەوخولگەی خۆی هەر لەگەڕدایە تا ئەوکاتە بۆی دیاریی کراوە ﴿ذلك تقدیر العزیز العلیم﴾ ئەوهاتو چۆوگەڕانە بەوشێوە وردە، خەملاندنی خوای بەدەسەلاتی زانایە ﴿ ٣٩ والقمر قدرناه منازل﴾ وە گەڕانی مانگیشمان خەملاند – کە ئەمیش بەڵگەیەکە بۆدەسەلات وتوانایی خۆمان – بە بیست و هەشت مەنزڵ وئاسۆ, تاهەموو شەوێك دابەزێتە جێگایەکیانەوە. پاشان دووشەو، یان شەوێك پەنائەگرێ ﴿حتی عاد کالعرجون القدیم﴾ تا وەك پەلیکۆنی باریکی وشکی زەرد بووی کەوانەیی داری خورمای لێ دێت ﴿ ٤٠ لا الشمس ینبغی لها أن تدرك القمر﴾ نە بۆ خۆر دەکرێ بگاتە مانگ, تا هەردوو پێکەوە کۆببنەوە و، نوورو رووناکیمانگ هەڵگرێ و, تا قیامەت هەر رۆژ بێت ﴿ولا اللیل سابق النهار﴾ نە شەویش پێشی رۆژ دەکەوێ کە ئیتر تاکاتی کۆتایی دنیا, هەر شەووتاریك بێت. نەخێر، شتی وا ناشێ ونابێ، بەڵکو خوا هەردووکیانی بەجۆرێ دروستکرد, کە کاری یەکتر تێك نەدەن ﴿وکل فی فلك یسبحون﴾ هیچیشیان ناچنە خولگەی ئەویتریان، بەڵکو هەریەکەیان لەخولگەی خۆیا دەسووڕێتەوە، وەك مەلەوان دێن ودەڕۆن. بەڵێ خۆر لەخولگەی سووڕانەوەی خۆیدا بۆماوەی یەکساڵ, ئەوسا (١٢) بوورجەکانی خۆی دەبڕێ، لەکاتێکدا هەیڤی بەیەك مانگ مەسیرەکەی خۆی دەبڕێ، دیارە بەپێی ئەم نەخشە خواییی یە, مانگ (١٢) ئەوەندەی خۆر – لە خولگەی خۆیدا تیژرەوترە، بۆیە ئەفەرمووێ: هەرگیز خۆرناگاتە مانگ تا بتوانێ مەسیرە کەی خۆی بە یەك مانگ ئەنجام بدات. بۆئەم بیژەی (لمستقر لها)یە دوو تەفسیرهەیە، یەکێکیان دەڵێ: مەبەست ئەوەیە: لەجێ و قەرارگەی خۆیدا کە لەژێر (عەرش)دایە و بەرووی زەوییدا هەردەم دێت و دەڕوا سوژدە دەباو داوای مۆڵەتی هەڵهاتن وگەڕانەوە دەکا بۆ جارێکی دیکە، وەك لە فەرموودەیەکدا هاتووە: ((فإنها تذهب حتی تسجد تحت العرش)). فتح الباری:٤٠٢/٨. هەروا ئەم فەرموودەیەش: ((مستقرها تحت العرش)). فتح الباری:٤٠٢/٨. تەفسیری دووەمیشیان دەڵێ: مەبەست ئەوەیە کە خۆر تاهاتنی رۆژی قیامەت بەردەوام لەو خولگەی خۆیەدا هەر دەگەڕێ و ناوەستێ. تەفسیری یەکەم پێیدەڵێن (مستقری مەکانی)و، دووەمیش (مستقری زەمانیی)، خوای کارجوانیش چاکتر دەزانێ. تەفسیری (ئیبن کەسیر).

**گەشتی گەمیی بەناو دەریادا نیشانەی خوایە :**

﴿ ٤١ وآیة لهم أنا حملنا ذریتهم فی الفلك المشحون﴾، نیشانەیەکی توانایی خۆمانە بۆیان کە: ئێمە وەچەو نەوەکانی ئەوانمان لەناو کەشتی پڕدا بەناو دەریادا بەوهەموو شتوومەکەوە هەڵگرتووە، ئەهاتن ودەچوون و نەشمان ئەهێشت نقوم بن. ﴿ ٤٢ وخلقنا لهم من مثله ما یرکبون﴾ ولە وێنەی کەشتییدا , ئەوی بە کەڵکی سواری بێت , بۆمان دروستکردن ﴿ ٤٣ وإن نشأ نغرقهم فلا صریخ لهم﴾ خۆ ئەگەر بمانەوێ لە بنی دەریادا نقومیان بکەین, نقومیان ئەکەین، جا ئەوکاتە هیچ فریاد رەسێکیان بۆنابێ ﴿ولا هم ینقذون﴾ و رزگاریش ناکرێن ﴿ ٤٤ إلا رحمة منا ومتاعا إلی حین﴾ مەگەر هەر رەحمەت ومیهرەبانی خۆمان فریایان کەوێ , تا ئەوکاتە دیاریکراوە بۆ ژیان, مۆڵەتیان

بدەین و بەهرەمەند بن , ئەگینا کەسێك ناتوانێ رزگار یان بکاو بیانژیەنێ ﴿٤٥ وإذا قيل لهم اتقوا ما بين أيديكم وما
خلفكم﴾ کاتێکیش پێیان بگوترێ: لەو سزایەی پێشتان,واتە: ئەوسزایەی ئوممەتەکانی پێشی پێ سزا دران, وەلەو
سزایەی دواوەتان (سزای ئاخیرەت) خۆ پارێزن ﴿لعلكم ترحمون﴾ بەڵکو رەحمتان پێ بکرێت , دەبینی روو
وەردەگێڕن و قبووڵیان نیە!.

**موشریکان سەرلێشێواوو گومڕان:**

﴿٤٦ وما تأتيهم من آية من آيات ربهم﴾ هەرئایەتێ بێت بۆ هاوبەشدانەرەکان , لە ئایەتەکانی پەروەردگاریان
﴿إلا كانوا عنها معرضين﴾ هەر رووی لێ وەردەگێڕن ﴿٤٧ وإذا قيل لهم انفقوا مما رزقكم الله﴾ وکاتێکیش پێیان
بگوترێ: لەو رزق وڕۆزیەی خوا پێیداون, ببەخشن لەرێی
خواداو بیدەن بەهەژارەکان ﴿قال الذين كفروا للذين آمنوا﴾
کافرو بێ باوەڕەکان بەخاوەن برواکانیان دەوت: ﴿أنطعم من
لو يشاء الله أطعمه﴾ ئاخۆ ئێمە نان وخۆراك بەکەسێك بدەین
کە ئەگەر خوا ویستبای خۆی خواردنیدەدانێ؟واتە:
کەسێك هەژار کەوتبێ , مافی بەسەر ئێمەوە نییە, دەبێ خوا
خۆی بیژییەنێ! ﴿إن أنتم إلا في ضلال مبين﴾ نا, ئێوە
هەرلەگومڕاییەکی ئاشکرادان کە بەئێمە ئەڵێن خۆراك
بەهەژاران بدەن.

**بەلای موشریکەوە زیندووبوونەوە دوورە:**

﴿٤٨ ويقولون متى هذا الوعد إن كنتم صادقين﴾ و
بەگاڵتەشەوە ئەڵێن: دە ئەگەر ئێوە راست دەکەن, ئەو
هەڕەشەو گوڕەشەو بەڵێنەیە بۆ زیندووبوونەوەو سزاو تۆڵە
کەیدێ؟ دیارە بڕوایان بەزیندوو بوونەوەو سزاوتۆڵە نیە ﴿٤٩
ما ينظرون إلا صيحة واحدة تأخذهم﴾ مەگەر
هەرچاوەڕوانی یەك نەعرەتەوشریخەیەك بن, لەناکاو پەیدا
ببێ و لەناویانبەرێ ﴿وهم يخصمون﴾ ئەوانیش لەوکاتەدا
- سەبارەت بە درۆو راستی زیندوو بوونەوە- سەرگەرمیی مشت ومڕیی ناو خۆیانن ﴿٥٠ فلا يستطيعون توصية
ولا إلى أهلهم يرجعون﴾ ئەو شریخەونەعرەتەیە ئەوندە بەپەلە دەرگایان پێدەگرێ, ئیتر نە ئەتوانن وەصیەتێك
بکەن, نەئەشتوانن بگەڕێنەوە ناو خانەوادەی خۆیان و,هیچ چارەسەرێکیشیان نیە.

**نەخشەی زیندووبوونەوە:**

﴿٥١ ونفخ في الصور فإذاهم من الأجداث إلى ربهم ينسلون﴾ خەڵکی بەنەفخەی یەکەم هەمووئەمرێن وپاشان
بۆجاری سێیەم فوو بە شەیپوردا ئەکرێت ,ئەوسا کتوپڕ بەپەلە لە گۆڕەکانیان هەموودێنەدەرێ و دەبرێن بۆلای
دادگای پەروەردگاریان بۆ پاداش و تۆڵە ﴿٥٢ قالوا يا ويلنا من بعثنا من مرقدنا﴾ هەرکە زیندووشکرانەوە بە سەر
سوڕمانێکەوە ئەڵێن:تیاچوونی خۆمان! کێ لەگۆڕو خەوگاکەماندا زیندووی کردینەوەو هەڵیساندین؟! ﴿هذا ما وعد

الجزء الثالث والعشرون — سورة يس

وَءَايَةٌ لَّهُمْ أَنَّا حَمَلْنَا ذُرِّيَّتَهُمْ فِي ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ ﴿٤١﴾ وَخَلَقْنَا
لَهُم مِّن مِّثْلِهِۦ مَا يَرْكَبُونَ ﴿٤٢﴾ وَإِن نَّشَأْ نُغْرِقْهُمْ فَلَا صَرِيخَ لَهُمْ
وَلَا هُمْ يُنقَذُونَ ﴿٤٣﴾ إِلَّا رَحْمَةً مِّنَّا وَمَتَٰعًا إِلَىٰ حِينٍ ﴿٤٤﴾ وَإِذَا
قِيلَ لَهُمُ ٱتَّقُوا۟ مَا بَيْنَ أَيْدِيكُمْ وَمَا خَلْفَكُمْ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٤٥﴾
وَمَا تَأْتِيهِم مِّنْ ءَايَةٍ مِّنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِمْ إِلَّا كَانُوا۟ عَنْهَا مُعْرِضِينَ
﴿٤٦﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ أَنفِقُوا۟ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟
لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَنُطْعِمُ مَن لَّوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ أَطْعَمَهُۥٓ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا فِي
ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٤٧﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ
﴿٤٨﴾ مَا يَنظُرُونَ إِلَّا صَيْحَةً وَٰحِدَةً تَأْخُذُهُمْ وَهُمْ يَخِصِّمُونَ
﴿٤٩﴾ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ تَوْصِيَةً وَلَآ إِلَىٰٓ أَهْلِهِمْ يَرْجِعُونَ ﴿٥٠﴾
وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَإِذَا هُم مِّنَ ٱلْأَجْدَاثِ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يَنسِلُونَ
﴿٥١﴾ قَالُوا۟ يَٰوَيْلَنَا مَنۢ بَعَثَنَا مِن مَّرْقَدِنَا ۜ هَٰذَا مَا وَعَدَ ٱلرَّحْمَٰنُ
وَصَدَقَ ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿٥٢﴾ إِن كَانَتْ إِلَّا صَيْحَةً
وَٰحِدَةً فَإِذَا هُمْ جَمِيعٌ لَّدَيْنَا مُحْضَرُونَ ﴿٥٣﴾ فَٱلْيَوْمَ لَا تُظْلَمُ
نَفْسٌ شَيْـًٔا وَلَا تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٥٤﴾

٤٤٣

الـرحمن وصـدق المرسـلون﴾ دیارەئەمـە ئـەو بەڵێنەیـە کـە خوایبەخشـندە پێمـانی دابـوو لـە سـەر زمـانی پێغەمبەرەکانەوە، پێغەمبەرەکانیش راستیان وت. ﴿٥٣ إن كانت إلا صيحة واحدة﴾ ئەو نەفخەی زیندوو کردنەوەش، ئەنجامی یەك نەعرەتە و یەك دەنگی گەورەبوو ﴿فإذا هم جميع لدينا محضرون﴾ ئەوسا هەموویان بەزوویی لای ئێمە ئامادەکراون بۆ لێکۆڵینەوەو حیساب ﴿٥٤ فاليوم لا تظلم نفس شيئا﴾ ئینجا لـەو رۆژەدا تۆز قاڵەیەك ستەم لە هیچ کەسێ ناکرێ ﴿ولا تجزون إلا ماكنتم تعملون﴾ پاداش وتۆڵەی ئەوە نەبێ کردووتانە، پاداش نادرێنەوە.

**بەهەشتیەکان لە عەیش و نۆشدان:**

﴿٥٥ إن أصحاب الجنة اليوم فى شغل فاكهون﴾ بەڕاستیی بەهەشتیەکان لەم رۆژەدا بەنیعمەتی خواوە سەر گـەرم وشـادن ﴿٥٦ هـم وأزواجهـم فـى ظلال علـى الأرائك متكئـون﴾ خۆیـان و هاوسـەرەکانیان، لەسـێبەرێکی چـڕو پڕداو لەسەر چەند تـەختێکی رازاوەدا پاڵیان داوەتـەوە ﴿٥٧ لهم فيها فاكهة﴾ لەوێش هەموو جۆرە میوەیەکیان بۆهەیە ﴿ولهم مايدعون﴾ وداوای هەرشتێکیش بکەن ئامادەیە بۆیان ﴿٥٨ سلام قولا من رب رحيم﴾ سەلام ودرودێکیشیان بەقسە پێدەگات لەلایەن خوای بە رحمەوە،وەك ئایەتی (تحیتهم یوم یلقونه سلام..)٣٣/٤٤. دووپاتی ئەوە دەکاتەوە.

**رۆژی سەلا تاوانباران جیا دەکرێنەوە:**

ئینجـا رووئەکرێتـە تاوانبـاران و پێیـان ئـەوترێ: ﴿٥٩ وامتـازوا اليـوم أيهـا المجرمـون﴾ ئـەی تاوانبـاران! دەسـا ئەمڕۆجیاببنـەوە لـە ئیمانـدارەکان. ئینجـا بۆئـەوەی زیـاتر تووشی ئێش وئازار ببن، لەلایەن خواوە پێیان ئەوترێ:﴿ الم أعهـد إلـيكم يـا بنـى آدم﴾ ئـەی نـەوەکانی ئـادەم! ئـاخرمن پێشتر وەسیەتم بۆ نەکردن ﴿أن لا تعبدوا الشيطان إنه لكم عـدو مـبين﴾ کـە شـەیتان نەپەرسـتن، چـونکە ئـەو بۆئێـوە دوژمنێکـی ئاشـکرایە؟ ﴿٦١ وأن اعبـدونى هـذا صـراط مستقيم﴾ ئەیفەرمانم پێنەکردن کە تەنها من بپەرستن وپەیڕەویی لەمن بکەن، ئائەمەیە(واتـە:پەرستنم بەتـەنیا) ڕێ راستەکە ﴿٦٢ ولقد أضل منكم جبلا كثيرا﴾ بێگومان شـەیتان خـەڵکێکی زۆری گومڕا کرد لێتان ﴿افلم تكونوا تعقلون﴾ دەئایا تێناگەن و ژیرنابن؟ ﴿٦٣ هذه جهنم التى كنتم توعدون﴾ ئائەمە هەرئەو دۆزەخەیە کەلەدونیادا بەڵێنتان پێدرابوو، بڕواتان نەکرد ﴿٦٤ إصلوها اليوم بما كنتم تكفرون﴾ دەفەرموون بەهۆی بێباوەڕییتانەوە ئەمڕۆ بچنە ناوی.

**رۆژی قیامەت مۆر لەدەمی خوانەناسان دەدرێت:**

﴿٦٥ اليوم نختم على افواههم﴾ ئـەمڕۆ (رۆژی قیامـەت) مـۆر دەنـێن بە سـەردەمیاندا و نـاتوانن بـەزمان هـیچ قسـەیەك بکـەن ﴿وتكلمنا أيديهم﴾ دەستەکانیشیان قسـەمان لەگـەڵ ئەکـەن ﴿وتشهد أرجلهم بما كانوا يكسبون﴾

الجزء الثالث والعشرون — سورة يس

إِنَّ أَصْحَٰبَ ٱلْجَنَّةِ ٱلْيَوْمَ فِى شُغُلٍ فَٰكِهُونَ ﴿٥٥﴾ هُمْ وَأَزْوَٰجُهُمْ
فِى ظِلَٰلٍ عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ مُتَّكِـُٔونَ ﴿٥٦﴾ لَهُمْ فِيهَا فَٰكِهَةٌ وَلَهُم
مَّا يَدَّعُونَ ﴿٥٧﴾ سَلَٰمٌ قَوْلًا مِّن رَّبٍّ رَّحِيمٍ ﴿٥٨﴾ وَٱمْتَٰزُوا۟ ٱلْيَوْمَ
أَيُّهَا ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٥٩﴾ ۞ أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَٰبَنِىٓ ءَادَمَ أَن لَّا
تَعْبُدُوا۟ ٱلشَّيْطَٰنَ ۖ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٦٠﴾ وَأَنِ ٱعْبُدُونِى ۚ
هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٦١﴾ وَلَقَدْ أَضَلَّ مِنكُمْ جِبِلًّا كَثِيرًا ۖ
أَفَلَمْ تَكُونُوا۟ تَعْقِلُونَ ﴿٦٢﴾ هَٰذِهِۦ جَهَنَّمُ ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ
﴿٦٣﴾ ٱصْلَوْهَا ٱلْيَوْمَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴿٦٤﴾ ٱلْيَوْمَ نَخْتِمُ
عَلَىٰٓ أَفْوَٰهِهِمْ وَتُكَلِّمُنَآ أَيْدِيهِمْ وَتَشْهَدُ أَرْجُلُهُم بِمَا كَانُوا۟
يَكْسِبُونَ ﴿٦٥﴾ وَلَوْ نَشَآءُ لَطَمَسْنَا عَلَىٰٓ أَعْيُنِهِمْ فَٱسْتَبَقُوا۟
ٱلصِّرَٰطَ فَأَنَّىٰ يُبْصِرُونَ ﴿٦٦﴾ وَلَوْ نَشَآءُ لَمَسَخْنَٰهُمْ
عَلَىٰ مَكَانَتِهِمْ فَمَا ٱسْتَطَٰعُوا۟ مُضِيًّا وَلَا يَرْجِعُونَ
﴿٦٧﴾ وَمَن نُّعَمِّرْهُ نُنَكِّسْهُ فِى ٱلْخَلْقِ ۖ أَفَلَا يَعْقِلُونَ ﴿٦٨﴾
وَمَا عَلَّمْنَٰهُ ٱلشِّعْرَ وَمَا يَنۢبَغِى لَهُۥٓ ۚ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ وَقُرْءَانٌ مُّبِينٌ
﴿٦٩﴾ لِّيُنذِرَ مَن كَانَ حَيًّا وَيَحِقَّ ٱلْقَوْلُ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٧٠﴾

أولم يروا — ٤٤٤

پێیەکانیشیان شایەتی دەدەن بەوەی کردوویانە. ئیمامی (موسلیم) لە (ئەنەس)ەوە ئەڵێ: (کنا عند رسول الله ﷺ فضحك فقال: ((هل تدرون مم أضحك؟)) قال: قلنا الله ورسوله أعلم. ((قال: من مخاطبة العبد ربه، يقول: يارب، ألم تجرني من الظلم؟ قال: يقول بلى. قال: فيقول، فإني لا اجيز على نفسي إلا شاهدا مني، قال: فيقول: كفى بنفسك اليوم عليك شهيدا، وبالكرام الكاتبين شهودا، قال فيختم على فيه فيقال: لأركانه، أنطقي، قال: فتنطق بأعمالهن، قال ثم يخلى بينه وبين الكلام فيقول بعدا لكن وسحقا، فعنكن كنت أناضل)) في الزهد والرقائق (٢٩٦٩) حديث رقم (١٧). ئێمە کاتێ لای پێغەمبەر بووین ﷺ خۆ بەخۆ پێکەنی، فەرمووی: دەزانن لەچی پێدەکەنم؟! وتمان خواو پێغەمبەری ئەو باشتر ئەزانن. فەرمووی: لە موجادەلەی بەندە پێدەکەنم لەگەڵ پەروەردگاریدا, دەڵێ: ئەی پەروەردگاری من! ئایا لە زوڵم وستەم پەنام نادەی؟ خوا ئەفەرمووێ: بەڵێ، (بەندەکەش) ئەڵێ: ئەوجا شایەتێ لەخۆم نەبێت قبووڵم نیە, خواش دەفەرموێ: باهەرخۆ توو فریشتە تۆمارکەرەکانت شایەد بن، ئەوسا مۆر لەدەمی دەدرێ، پاشان بە ئەندامەکانی تری دەڵێ: ئێوەش قسە بکەن، ئەوانیش هەرشتێکیان کردبێ -وەك خۆی- دەیگێڕنەوە، پاشان ئەڵێ: هەردوور بن لەرەحمەتی خوا، دەك بمرن، خۆ من لەبەر ئێوە بەرگریم دەکردو تێدەکۆشام.

﴿[٦٦] ولو نشاء لطمسنا على اعينهم﴾ خۆئەگەر بمانەوێ نەبینن ,ئاسەواری چاوەکانیشیانمان نەدەهێشت تارێنوێن بن ﴿فاستبقوا الصراط﴾ ئینجا بەرەو رێگاکە پێشبڕکێیان کرد وەك جاران ﴿فأنى يبصرون﴾ جاچۆن دەبینن ئێمە کوێرمان کردبن؟! ﴿[٦٧] ولو نشاء لمسخناهم على مكانتهم﴾ ئەگەر مەیلیش بکەین لەجێی خۆیاندا (مەسخ)مان دەکردنەوە, واتە: شکڵ و بیچمان ئەگۆڕین و جموجوڵمان ایٚئەبڕین و وەك بەردوجیماداتمان ایٚدەکردن ﴿فما استطاعوا مضيا ولا يرجعون﴾ جا ئیتر نەیانتوانیبا نەبڕۆنە پێشێ، نەبگەڕێنە دواوە. ﴿[٦٨] ومن نعمره ننكسه في الخلق﴾ هەرکەسییش تەمەنی درێژ بکەین، دەرەنجام ژێرو ژووری دەکەین لەلاشەوجەستەو بیرو هۆشیدا , واتە: دەیگێرینەوە بۆ قۆناغی منداڵیی ولاوازی و,هیچ توانایەکی نامێنێ، وەك ئەفەرمووێ: (الله الذي خلقكم من ضعف ثم جعل من بعد ضعف قوة ثم جعل من بعد قوة ضعفا وشيبة يخلق ما يشاء وهو العليم القدير)٥٤/٣٠. یان دەفەرموێ: (ومنكم من يرد إلى أرذل العمر.)٥/٢٢. ﴿أفلا يعقلون﴾ دەئایا ئەوان تێناگەن و ژیرییان ناخەنە کارکە کەسێك بتوانێ کاری ئاوا بکات، ئەی چۆن ناتوانێ زیندووتان بکاتەوە؟!

## پێغەمبەر ﷺ شاعیر نەبووە:

بێ بڕواکان ئەیانوت: ئەوی (موحەممەد)ئەیڵێ شیعرو هۆنراوەیە! خوایش ئەفەرموێ: ﴿[٦٩] وما علمناه الشعر وما ينبغي له﴾ ئێمە هەرگیز شیعرو هۆنراوەمان فێری موحەممەد نەکردووە و، هۆنراوە وتنیش شیاوی ئەو نیە، مێژوو و (سیرە) هەردوو لەوەدا یەکدەنگن کە پێغەمبەر ﷺ شیعری نەوتووەو نەیشیزانیوە، ئەوەیش لەرۆژی (خەندەق)دا وتوویەتی لەسەر کێشی شیعرەکانی (عەبدوڵڵای کوڕی رەواحە):

لا هم لولا أنت ما اهتدينا ولا تصدقنا ولا صلينا...

ئەوەش لەرۆژی (حونەین)دا وتوویەتی:

أنا النبي لا كذب أنا بن عبد المطلب

ئەوەش ئەو رۆژە لە (غار) و (ئەشکەوتەکە)دا وتی:

هل أنت إلا إصبع دميت و في سبيل الله مالقيت

ئەمانە هیچکامێکیان بەنیازو مەبەستی شیعرەوە نەیگوتووە، هەر بۆیەش دەفەرمووێ: ((لأن یمتلئ جوف أحدكم قیحا خیر لە من أن یمتلئ شعرا)) سوێند بەخوا دڵ ودەروونی هەرکامێکتان پڕببێ لە کێم وزوخاو، لەوەباشترە بۆی پڕی بکا لەشیعرو هۆنراوە. پێشەوا ئەحمەد. (ئیبن کەسیر) دەڵێ: (وإسناده علی شرط الشیخین ولم یخرجاه). ﴿إن هو إلا ذكر وقرآن مبین﴾ ئەوەیش کە ئەو دەیڵێ هەر پەندوئامۆژگاریی و، قورئانێکی روون وئاشکرایە , نەك شیعر ﴿٧٠ لینذر من كان حیا﴾ تا ئەوکەسەی کە دڵ زیندووبڕواداره بترسێنێ ﴿ویحق القول علی الكافرین﴾ و بەڵێنی هاتنی سزای خواش بۆ بێبڕوایان بەجێ بگا، واتە: بیانووی هیچ کەسێك نەمێنێ ئەگەر لایداو سزا درا. جا هەرئەو مەبەستەش لە سوورەتی (٢٧/٨٠)، لەسوورەتی (٣٥/٢٢)دا هاتووە.



أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا خَلَقْنَا لَهُم مِّمَّا عَمِلَتْ أَيْدِينَا أَنْعَامًا فَهُمْ لَهَا
مَالِكُونَ ﴿٧١﴾ وَذَلَّلْنَاهَا لَهُمْ فَمِنْهَا رَكُوبُهُمْ وَمِنْهَا يَأْكُلُونَ ﴿٧٢﴾
وَلَهُمْ فِيهَا مَنَافِعُ وَمَشَارِبُ أَفَلَا يَشْكُرُونَ ﴿٧٣﴾ وَاتَّخَذُوا
مِن دُونِ اللَّهِ آلِهَةً لَّعَلَّهُمْ يُنصَرُونَ ﴿٧٤﴾ لَا يَسْتَطِيعُونَ
نَصْرَهُمْ وَهُمْ لَهُمْ جُندٌ مُّحْضَرُونَ ﴿٧٥﴾ فَلَا يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ
إِنَّا نَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴿٧٦﴾ أَوَلَمْ يَرَ الْإِنسَانُ أَنَّا
خَلَقْنَاهُ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ ﴿٧٧﴾ وَضَرَبَ لَنَا
مَثَلًا وَنَسِيَ خَلْقَهُ قَالَ مَن يُحْيِي الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ ﴿٧٨﴾
قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ
﴿٧٩﴾ الَّذِي جَعَلَ لَكُم مِّنَ الشَّجَرِ الْأَخْضَرِ نَارًا فَإِذَا أَنتُم
مِّنْهُ تُوقِدُونَ ﴿٨٠﴾ أَوَلَيْسَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ
بِقَادِرٍ عَلَىٰ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُم بَلَىٰ وَهُوَ الْخَلَّاقُ الْعَلِيمُ ﴿٨١﴾
إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئًا أَن يَقُولَ لَهُ كُن فَيَكُونُ ﴿٨٢﴾
فَسُبْحَانَ الَّذِي بِيَدِهِ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٨٣﴾

سُورَةُ الصَّافَّات



## پاتاڵ و وڵسات نیعمەتن و، نیشانەی خوان:

﴿٧١ او لم یروا انا خلقنا لهم مما عملت أیدینا انعاما﴾ ئایا نەیزانیوە کە ئێمە وشترو مەڕو بزن و گامان بۆ دروست کردوون ﴿فهم لها مالكون﴾ ئنجا بۆ خۆیان بوونە خاوەنیان ﴿٧٢ وذللناها لهم﴾ وا بۆشمان ڕام و ژێردەستە کردون ﴿فمنها ركوبهم ومنها یأكلون﴾ لەناویاندایە بۆ سوارییان و، تیایاندایە دەیخۆن ﴿٧٣ ولهم فیها منافع ومشارب﴾ وەچەندین قازانج و سوودیان تێدایە بۆیان، هەر لەخوریی وکورك و موو و پێست و ئێسك و شیرەکەیان ﴿افلا یشكرون﴾ دەسا ئیتر سوپاسگوزاری خودای بەخشندەو دلۆڤان ناکەن لەسەر گشت ئەو نیعمەتانەی؟! ﴿٧٤ واتخذوا من دون الله آلهة لعلهم ینصرون﴾ کەچی لە جیاتی شوکرانە بژێری بۆ خوا, چەند خواو پەرستراوێکیان بۆ خۆیان گرت! بەوئومێدەوە بەهانایانەوە بێن ویارمەتی بدرێن ﴿٧٥ لا یستطیعون نصرهم وهم لهم جند محضرون﴾ خۆ لەراستیدا ئەوخوانە ناتوانن یارمەتی پەرستیارەکانیان بدەن، ئەگەرچی ئەمان(بتپەرستەکان) سوپاو سەربازی ئامادەن لەبەر دەستیاندا و، سەرجەم هەمووشیان لەناو ئاگری دۆزەخدا ئامادە دەکرێن. ئینجا دڵنەوایی پەیامبەر ﷺ ئەکا و ئەفەرمووێ: ﴿٧٦ فلا یحزنك قولهم﴾ ئەو قسەو وتانەیان پێت ئەڵێن:وەك جادوبازە، شاعیرە،.. هتد, نابێ خەفەتبارت بکات ﴿إنا نعلم ما یسرون وما یعلنون﴾ چونکە ئەوان هەرچی لەدڵ بگرن وبیشارنەوەو هەرشتێکیش ئاشکرا بکەن, بێگومان ئێمە بەهەمووی ئەزانین.

## کافران حاشای ژینێکی تر دەکەن دوای مردن:

﴿٧٧ او لم یر الإنسان انا خلقناه من نطفة﴾ ئایائەو مرۆیە کە ئینکاری تواناو دەسەڵاتیخوا دەکا لەسەر زیندو بوونەوە -بەتایبەت کوڕەکەی ئوبەی- نەیزانیوە کە ئێمە ئەومان لە تنۆکە ئاوێکی قێزەون دروستکردووە؟ ﴿فإذا هو خصیم مبین﴾ کەچی وائێستا -لەباتی سوپاسگوزاریی- دوژمنێکی ئاشکرایە و، نکوڵی زیندوو بوونەوە ئەکات!!.

سوورەتی (١٦/٤)ش کە دەفەرمویٚ: (خلق الإنسان من نطفة فإذا هو خصيم مبين) هەر لەسەر هەمان مانا جەخت دەکات. ﴿٧٨ وضرب لنا مثلا ونسی خلقه﴾ مەسەل ونموونەیەکی بۆ هێناینەوە و، ئینکاری دەسەڵاتی ئێمەی کرد بۆ زیندووکردنەوەی ئادەمیزادو جن، وەدروستبوونی خۆی لەبیر کرد! ﴿٧٩ قال من يحيی العظام وهی رميم﴾ چەند ئێسکێکی رزیوی هێناو رووی لە پێغەمبەرکردو وتی: کێ ئەتوانێ ئەو ئێسك وپروسکە رزیوانە زیندوو بکاتەوە؟!.بۆ هۆی دابەزینی فرمایشی (أولم يری الإنسان),, (موجاهیدو عیکرەمە) دەڵێن: (ئوبەی کوڕی خەڵەف) ئێسکە رزیوێکی بەدەستەوە گرت و وردو خاشاکی کردو دای بەدەم باوە, ئەوسا بەپێغەمبەری ﷺ وت: تۆ پێت وایە کە خوا بتوانێ ئەمە زیندوو بکاتەوە! ئەویش فەرمووی: ((نعم، يميتك الله تعالی، ثم يبعثك، ثم يحشرك إلی النار)). بەڵێ.. خوا ئەتمرێنێ، لەپاشان زیندووت ئەکاتەوە، ئەوجا دەتنێرێ بۆ ئاگری دۆزەخ.

هەزار رەحمەت لە گۆڕەکەی (سەیید عەبدولڕەحیمی مەولەوی)یش، چەندە جوان ئەم باسەی لە (عەقیدە مەرضیە)کەیدا بە هۆنراوە هۆنیویەتەوەو دەڵێ:

فِـرْقَـةُ الـعِـنـادْ قَـدْ مـاتَـتْ أَيُـهـا　　فَـاقْرَأْنْ ((يس)) حتـی يـحييهـا

ئـەر پێشەی سـەردەست مەفتوتی ئۆبـەی　　جـەوابی حەزرەت تەماشا دەکەی

تـیـژی قـەطعی ئـەو طـەرزە دەلـیـلـە　　بـڕنـدەی رەگـی دڵـی تـەئـویـلـە

﴿قل يحييها الذی انشأها أول مرة﴾ تۆ بڵێ: ئەی موحەممەد ﷺ هەرئەو کەسە کە هەوەڵجار دروستیکردوون زیندوشتان ئەکاتەوە ﴿وهو بكل خلق عليم﴾ چونکە ئەو خوایە بەهەموو دروستکراوێك زاناو بەئاگایە ,ئەزانێ چۆنی دروستکردون و,چۆنیش زیندوویان بکاتەوە ﴿٨٠ الذی جعل لكم من الشجر الأخضر نارا﴾ هەرئەو زاتەدەسەڵاتدارەیە ئێوە زیندوودەکاتەوە کە لەداری سەوزو شین وتەڕئاگری بۆ دروستکردون ﴿فإذا انتم منه توقدون﴾ ئینجا ئێوەش (لەودەسە چیلە)یە ئاگر ئەکەنەوە. سەردەمی کۆن عەرەبەکان دوو جۆر داریان ئەهێنا، بەناوی (مرخ) و (عفار) و لەسەر یەکیان دەسوی ئاگری ئەگرت و سوودیان لێوەرئەگرت. جا کەسێك ئاوا بتوانێ لەداری تەڕ ئاگر فەراهەم بێنێ، ئایا هەرئەو خاوەن دەسەڵاتە ناتوانێ مردووان زیندوو بکاتەوە؟وەکو دەفەرموێ: ﴿٨١ أو ليس الذی خلق السموات والأرض بقادر علی ان يخلق مثلهم﴾ ئاخۆ ئەو خوایە توانیبێتی ئەم ئاسمانان و زەوییە بەدی بهێنێ تواناشی نییە بۆ جارێکی تر وێنەیان دروست بکاتەوە؟ ﴿بلی وهو الخلاق العليم﴾ بەڵێ ئەتوانێ و، هەرئەویشە دروستکارو زانیار﴿٨٢ إنما امره إذا اراد شيئا ان يقول له كن فيكون﴾ بەراستیی هەرکاتێ ویستیشتێ بەدی بهێنێ هەرئەوەیە کەپێی بفەرمێ ببە! ,ئەویش دەست بەجێ دەبێت. سوورەتی (١٦/٤٠): (إنما قولنا لشیٔ..) تەفسیرە بۆ ئەم ئایەتە. ﴿٨٣ فسبحان الذی بيده ملكوت كل شیٔ﴾ ساپاکی و بێ عەیبی هەربۆ ئەو خوایە دەسەڵاتی هەموو شتێکی بەدەستەوەیە ﴿واليه ترجعون﴾ هەر بۆلای ئەویش دەگەڕێنرێنەوە, بۆ لێکۆڵینەوەو پاداش و تۆڵە.

زۆر سوپاس و پێزانین بۆ پەروەرندەی جیهان کەیارمەتیدام بۆ تەواوکردنی تەفسیری ئەم سوورەتی (يس)ـە.

***　***　***

## ٣٧- سوورەتی ( صافات )ـە مەککەییەو ( ١٨٢ )ئایەتە.

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتەش وەك گشت سوورەتە مەککەییەکانی دیکە، باسی بناغە سەرەکییەکانی ئیسلام دەکات،وەکو یەکتاپەرستیی خواو سروش و نیگاو، زیندووبوونەوەو پاداش و تۆڵە. جا بۆ یەکەمجار باسی فریشتەو، هێزو دەسەڵات و توانایان دەکا، پاشان جنیەکان.. لەگەڵ داستانی هەندێ پەیامەران" بەوەکۆتاییشی دێت کە یارمەتیی و، کۆمەکیی خوا تەنها بۆ پەیامبەران و دۆستانی خۆی دەبێ.

بەم شێوەیەش دەست پێ ئەکات: ﴿بسم الله الرحمن الرحيم * [1] والصافات صفا﴾ سوێند بەو فریشتانەی زۆر بەوردیی لەبارەگای خوا پەرستییدا ریز دەبەستن وەملکەچ دەبن ﴿[2] فالزاجرات زجرا﴾ ئینجا بەو فریشتانەی پاڵدەنێن بە هەورەکانەوە بۆ ئەو جێگایەی خوا ویستی لەسەرە بۆ باراندنی باران ﴿[3] فالتاليات ذكرا﴾ و بەو فریشتانەش ئایەتەکانی قورئان بەسەر پەیامبەرەکاندا ئەخوێننەوە. (ئیبن مەسعوود و، ئیبن عەباس و، مەسرووق و، سەعیدی کوڕی جوبەیرو، عیکرەمەو، موجاهیدو، سەددیی و، قەتادە) ئەم بەڕێزانە هەموو وشەی: (صافات، زاجرات، تاليات) بە فریشتە مانا ئەدەنەوە، دەڵێن چونکە هەر فریشتەکانن لەئاسماندا ریزن، ئیمامی (موسلیم)یش: (٢٢٣/١) ئەم فەرموودەیە دێنێ وەدەفەرموێ: ((الا تصفون كما تصف الملائكة عند ربهم؟)). واتە: ئێوەش وەکو فریشتە بۆ ریز نابن؟ پرسیاریانکرد باشە! ئەوان چۆن لای خوای پەروەردگاریان ریز دەبن؟ فەرمووی: ((يُتمّون الصفوف المتقدمة، ويُراصُّون في الصف)). ریزی پێشەوە تەواو دەکەن و شان لە شانی یەکتر دەدەن.

الجزء الثالث والعشرون — سورة الصافات

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
وَٱلصَّٰٓفَّٰتِ صَفّٗا ﴿١﴾ فَٱلزَّٰجِرَٰتِ زَجۡرٗا ﴿٢﴾ فَٱلتَّٰلِيَٰتِ ذِكۡرًا ﴿٣﴾
إِنَّ إِلَٰهَكُمۡ لَوَٰحِدٞ ﴿٤﴾ رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا وَرَبُّ
ٱلۡمَشَٰرِقِ ﴿٥﴾ إِنَّا زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا بِزِينَةٍ ٱلۡكَوَاكِبِ ﴿٦﴾ وَحِفۡظٗا
مِّن كُلِّ شَيۡطَٰنٖ مَّارِدٖ ﴿٧﴾ لَّا يَسَّمَّعُونَ إِلَى ٱلۡمَلَإِ ٱلۡأَعۡلَىٰ وَيُقۡذَفُونَ
مِن كُلِّ جَانِبٖ ﴿٨﴾ دُحُورٗاۖ وَلَهُمۡ عَذَابٞ وَاصِبٌ ﴿٩﴾ إِلَّا مَنۡ خَطِفَ
ٱلۡخَطۡفَةَ فَأَتۡبَعَهُۥ شِهَابٞ ثَاقِبٞ ﴿١٠﴾ فَٱسۡتَفۡتِهِمۡ أَهُمۡ أَشَدُّ خَلۡقًا
أَم مَّنۡ خَلَقۡنَآۚ إِنَّا خَلَقۡنَٰهُم مِّن طِينٖ لَّازِبِۭ ﴿١١﴾ بَلۡ عَجِبۡتَ
وَيَسۡخَرُونَ ﴿١٢﴾ وَإِذَا ذُكِّرُواْ لَا يَذۡكُرُونَ ﴿١٣﴾ وَإِذَا رَأَوۡاْ ءَايَةٗ يَسۡتَسۡخِرُونَ
﴿١٤﴾ وَقَالُوٓاْ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾ أَءِذَا مِتۡنَا وَكُنَّا تُرَابٗا وَعِظَٰمًا
أَءِنَّا لَمَبۡعُوثُونَ ﴿١٦﴾ أَوَءَابَآؤُنَا ٱلۡأَوَّلُونَ ﴿١٧﴾ قُلۡ نَعَمۡ وَأَنتُمۡ دَٰخِرُونَ
﴿١٨﴾ فَإِنَّمَا هِيَ زَجۡرَةٞ وَٰحِدَةٞ فَإِذَا هُمۡ يَنظُرُونَ ﴿١٩﴾ وَقَالُواْ يَٰوَيۡلَنَا هَٰذَا
يَوۡمُ ٱلدِّينِ ﴿٢٠﴾ هَٰذَا يَوۡمُ ٱلۡفَصۡلِ ٱلَّذِي كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿٢١﴾
۞ ٱحۡشُرُواْ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ وَأَزۡوَٰجَهُمۡ وَمَا كَانُواْ يَعۡبُدُونَ ﴿٢٢﴾ مِن دُونِ
ٱللَّهِ فَٱهۡدُوهُمۡ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡجَحِيمِ ﴿٢٣﴾ وَقِفُوهُمۡۖ إِنَّهُم مَّسۡـُٔولُونَ ﴿٢٤﴾

مَا لَكُمۡ لَا تَنَاصَرُونَ — ٤٤٦

### خوا تاك و تەنیایە:

﴿[4] إن إلٰهكم لواحد﴾ سوێند بەوانە هەموو, بێ شك پەرستراوی ئێوە یەك پەرسراوە نەزیاتر ﴿[5] رب السموات والأرض وما بينهما ورب المشارق﴾ وپەروەردگاری ئاسمانەکان و زەویی و، هەرچیش لەنێوانیاندایەو، پەروەردگاری جێ هەڵاتنەکانی خۆرو, جێئاوابوونەکانیەتی. زاناکان دەڵێن: خۆر هەموو رۆژێ لەجێگایەك هەڵدێ و، لەجێگایەکیش ئاوا ئەبێ,چونکە بۆ هەر رۆژێ لە رۆژەکانی ساڵ(مەشریق)ێك و(مەغریب)ێك هەیە, دە پەروەردگار خاوەنی هەموویانە.

**رازاندنەوەوی ئاسمان و پاراستنی لە کوڵەی شەیتان:**

﴿٦ إنا زينا السماء الدنيا بزينة الكواكب﴾ بێگومان ئێمە ئەم ئاسمانە نزیك بە ئێوەمان بەچەندین ئەستێرەی رووناك ودرەوشاوە رازاندۆتەوە ﴿٧ وحفظا من كل شيطان مارد﴾ و بەو ئەستێرانەش بەباشی پاراستوومانە لەهەر شەیتانێکی سەرکەش و یاخیی وبێخێر ﴿٨ لا يسمعون إلى الملإ الأعلى﴾ و ئەو جنۆکە وشەیتانانە، ناتوانن لە فریشتەی باڵانشین کوڵە بکەن و گوێ بۆ قسەو توێژیان بگرن ﴿ويقذفون من كل جانب﴾ و هەرکاتێکیش ویستیان بەرەوئاسمان بچن و، بیانەوێ گوێ لە فریشتەکان بگرن، لە گشت لاوە بەئەستێرەی گڕدار راودەنرێن و، رەت دەکرێنەوەو، تیرباران دەکرێن ﴿٩ دحورا﴾ بۆ دوورخستنەوەیان لە گوێگرتن بۆ هەواڵە گرنگەکانی ئاسمان! ﴿ولهم عذاب واصب﴾ ولەقیامەتیشدا سزایەکی هەمیشەیان بۆ هەیە ﴿١٠ إلا من خطف الخطفة﴾ مەگەر کەسێکیان لەکتوپڕداو بەدزی، شتێ لە هەواڵەکان برفێنێ ﴿فأتبعه شهاب ثاقب﴾ دەسبەجێئەویش بزیسکی گڕدارو سووتێنەری شوێندەکەوێ. راڤەکەرانی قورئان دەڵێن: هەندێ جار شەیتانە سەرکێشەکان لە دەستەی (مەلەئولئەعلا) قسەو باس و، کاروباری نهێنییان ئەدزیی، (جا هەرکە دەیان ویست بەرەو زەوی بێنە خوارەوە بەو پزیسکە گڕدارانە ئەسوتێنران. (مەراغیی –خوای لێ رازی بێ– لە تەفسیری ئایەتەکانی (٧–١٠)دا ئەڵێ:مەبەست ئەوەیە کە خوای بەدەسەڵات ناهێڵێئادەمزاد وجنیە سەرکێشەکان – ئەوانەیان بیرناکەنەوە لەدەسەڵاتی خوا – سوود لە پانتایی وئارایشی ئەو ئاسمانە رازێنراوەیە وەرگرن و، زۆربەشیان لەزەویدا زیندان دەکرێن و، ناهێڵێ لەوهەموو جەماڵ و کەماڵە تێبگەن، وە لەهەموو لایەکەوە هەواو ئارەزوو بەرەو فەسادو خراپەکاری ئەیانبات. (سید قطب) – بەرمیهرەبانی خوا بکەوێ– دەڵێت: ئێمە نازانین ئەوشتە نهێنیانە چۆن ئەدزرێن و، چۆنیش بەو ئەستێرە گڕدارانە (نەیازك) دەسوتێنرێن؟! چونکە ئەوکارە کارێکی نادیارە و، حەواڵەی زانیاریی خوا دەکرێن.

**ژینی پاش مردن:**

﴿١١ فاستفتهم﴾ دەساتۆ ئەی موحەممەد! ﷺ لەوانە کە نکووڵی زیندوو بوونەوە دەکەن بپرسە: ﴿اهم اشد خلقا ام من خلقنا﴾ ئاخۆ دروستکردنی ئەوان–لەپاش مردن– زۆر گرنگترو سەختترە: یان ئەو ئاسمان و زەویی و فریشتانەی دروستمانکردوون؟! دیارە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەویی سەخت ترو گرانترە، جا کەواتە ئێوە چۆن ددان نانێن بە زیندوو بوونەوەدا؟!، ئەمەیە کەخوا لە جێیەکی تردا دەفەرموێ: (لخلق السموات والأرض أكبر من خلق الناس ولكن أكثر الناس لا يعلمون)٤٠/٥٧. ﴿إنا خلقناهم من طين لازب﴾ بێگومان ئێمە ماکی ئەوانمان (واتە:ئادەم)لە قوڕێکی نەرمی پێکەوە نوساوو لینج دروستکردووە ﴿بل عجبت﴾ بەڵکو تۆ لەململانێی ئەوان , دەربارەی ئەو هەواڵە یەقینەیە سەیر داماویی ﴿ويسخرون﴾ وئەوانیش بۆخۆیان هەر خەریکی حەنەکێ و گاڵتەومەسخەرەن بە تۆو بە زیندووبوونەوە ﴿١٣ وإذا ذكروا لا يذكرون﴾ و هەرکاتێکیش ئامۆژگاری بکرێن، ئامۆژگاری وەرناگرن،چونکە زۆر دڵڕەق ویاخیین ﴿١٤ وإذا راوا آية يستسخرون﴾ و هەرکاتێکیش نیشانەیەك(وەك دووکەرتبوونی مانگ) دەبینن، لاقرتێ و مەسخەرە دەکەن! ﴿١٥ وقالوا إن هذا إلا سحر مبين﴾ ودەڵێن ئەمە هەرجادوویەکی ئاشکرایە و هیچیتر نیە! ﴿١٦ إذا متنا وكنا ترابا وعظاما﴾ ئاخۆ ئێمە کە مردین و بووینە گڵ وچەند ئێسك وپروسکێك ﴿إنا لمبعوثون﴾ راستە جارێکیتر–وەك ئێوە دەڵێن– زیندوو ئەکرێینەوە؟! ﴿١٧ او آباؤنا الأولون﴾ وێڕای باوکە پێشووەکانمان؟! ﴿١٨ قل نعم وانتم داخرون﴾ بڵێ: ئەرێ هەمووتان زیندوو ئەکرێنەوە و ملکەچ و پەست و ریسواو زەبوونیشن: وەکو دەفەرمووێ: (وكل أتوه داخرين)٢٧/٨٧. یا دەفەرمووێ: (سیدخلون

جهنم داخرين)٦٠/٤٠ . ﴿[١٩] فإنما هى زجرة واحدة﴾ ئەوەش(واتە: نەفخەی زیندووکردنەوەکە) لای خوا تەنها تێراخوڕین وشریخەیەکی گەورەیە بۆ زیندوو بوونەوەیان ﴿فإذا هم ينظرون﴾ ئیتر دەست بەجێ زیندوو ئەبنەوەوبۆ خۆیان تەماشا دەکەن و دەڕوانن,یان چاوەڕوانی حیساب و سزاو تۆڵە دەکەن.

**سەختی و دژواریی ڕۆژی پەسلاَن:**

﴿[٢٠] وقالوا يا ويلنا هذا يوم الدين﴾ هەرکە ئەو هەوڵ و نارەحەتییەیان دی, دەڵێن: ماڵ وێران خۆمان! خۆ ئەمە ڕۆژەکەی پاداش و تۆڵەیە! ﴿[٢١] هذا يوم الفصل الذى كنتم به تكذبون﴾ لەلایەن فریشتەکانەوە پێیان ئەوترێ: بەڵێ ئەمە ئەو ڕۆژەیە پاك وپیس جیادەکرێنەوەکە ئێوە بڕواتان پێینەبوو ﴿[٢٢] احشروا الذين ظلموا وأزواجهم وماكانوا يعبدون * [٢٣] من دون الله﴾ فریشتەکان بەیەکتر دەڵێن: دەسائادەی ئەوانە وا ستەمیان دەکرد وموشریك بوون، خۆیان وهاوشێوەکانیان و، ئەوانەش کە لەباتی خوا دەیانپەرستن، گش کۆبکەنەوە: کافر لەتەك کافرا، شەرواڵ پیس لەگەڵ شەرواڵ پیسدا، عەرەقخۆر لەگەڵ عەرەقخۆردا..هتد ﴿فاهدوهم إلى صراط الجحيم﴾ ئەوساش ڕێی دۆزەخ بۆ هەموان دەست نیشان بکەن ﴿[٢٤] وقفوهم إنهم مسؤلون﴾ و ڕایانگرن! چونکە بەڕاستیی لە وتەو کردەوەکانیان بەر پرسیارن ﴿[٢٥] ما لكم لا تناصرون﴾ پێیان ئەوترێ: چیتانە، بۆ یارمەتی یەکتر نادەن؟! ﴿[٢٦] بل هم اليوم مستسلمون﴾ بەڵێ ناتوانن هاوکاری یەکتر بکەن، بەڵکوئەمڕۆ کەقیامەتە هەموو بەرامبەر بەفەرمانی خوا ملکەچ وەستاون.

**تێکڕایی موشریکان لە ڕۆژی قیامەت:**

﴿[٢٧] واقبل بعضهم على بعض يتساءلون﴾ لەوکاتەدا خۆ بەزلزان وسەرکوتکراوەکان, ڕوویان کردۆتە یەکترو لەیەکتر دەپرسن ﴿[٢٨] قالوا إنكم كنتم تأتوننا عن اليمين﴾ دەڵێن: بەڕاستیی ئێوەبوون بە نێوی خێرخوازیی، کە لەڕێی چاك وخێرو ڕاستەوە پەیتا پەیتا دەهاتنە لامان و قسەتان بۆ ئەدەکردین ودەرەنجام لەخشتەتان بردین؟ ﴿[٢٩] قالوا بل لم تكونوا مؤمنين﴾ سەرۆکەکانیش دەڵێن: بەڵکو ئێوە هەرخۆتان بڕواتان بەخواوبە فەرمانەکانی خوا نەبوو ﴿[٣٠] وما كان لنا عليكم من سلطان﴾ ئێمە هیچ زۆرودەسەلاَتێکمان لە سەرتان نەبوو ﴿بل كنتم قوما طاغين﴾ بەڵکو ئێوە هەر لەبنەڕەتا خۆتان هۆزو گەلێکی یاخیی و، لەسنوور دەرچوو بوون ﴿[٣١] فحق علينا قول ربنا﴾ جا وا ئێستاش بڕیاری پەروەردگارمان لەسەرمان ڕاستگەڕا ﴿إنا لذائقون﴾بێسۆ دەبێ ئێمە ئەوسزایە بچێژین ﴿[٣٢] فأغويناكم إنا كنا غاوين﴾ بەڵێ لەبەرئەوە ئێمە خۆمان گومڕا بووین , ئێوەشمان گومڕا کرد ﴿[٣٣] فإنهم يومئذ فى العذاب مشتركون﴾ جا بەڕاستی گش ئەمانە (پێشەواو شوێنکەوتوو) لەو ڕۆژەدا لە سزاو لە جەزرەبەدا ,شەریك وهاوبەشن ﴿[٣٤] إنا كذلك نفعل بالمجرمين﴾ بە ڕاستیی ئێمە

الجزء الثالث والعشرون | سورة الصافات

مَا لَكُمْ لَا تَنَاصَرُونَ ﴿٢٥﴾ بَلْ هُمُ ٱلْيَوْمَ مُسْتَسْلِمُونَ ﴿٢٦﴾ وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ
عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَآءَلُونَ ﴿٢٧﴾ قَالُوٓا۟ إِنَّكُمْ كُنتُمْ تَأْتُونَنَا عَنِ ٱلْيَمِينِ ﴿٢٨﴾
قَالُوا۟ بَل لَّمْ تَكُونُوا۟ مُؤْمِنِينَ ﴿٢٩﴾ وَمَا كَانَ لَنَا عَلَيْكُم مِّن سُلْطَٰنٍۭ
بَلْ كُنتُمْ قَوْمًا طَٰغِينَ ﴿٣٠﴾ فَحَقَّ عَلَيْنَا قَوْلُ رَبِّنَآ ۖ إِنَّا لَذَآئِقُونَ ﴿٣١﴾
فَأَغْوَيْنَٰكُمْ إِنَّا كُنَّا غَٰوِينَ ﴿٣٢﴾ فَإِنَّهُمْ يَوْمَئِذٍ فِى ٱلْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ
﴿٣٣﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَفْعَلُ بِٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٣٤﴾ إِنَّهُمْ كَانُوٓا۟ إِذَا قِيلَ لَهُمْ
لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ يَسْتَكْبِرُونَ ﴿٣٥﴾ وَيَقُولُونَ أَئِنَّا لَتَارِكُوٓا۟ ءَالِهَتِنَا
لِشَاعِرٍ مَّجْنُونٍۭ ﴿٣٦﴾ بَلْ جَآءَ بِٱلْحَقِّ وَصَدَّقَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٣٧﴾ إِنَّكُمْ
لَذَآئِقُوا۟ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَلِيمِ ﴿٣٨﴾ وَمَا تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ
﴿٣٩﴾ إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٤٠﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ رِزْقٌ مَّعْلُومٌ ﴿٤١﴾
فَوَٰكِهُ ۖ وَهُم مُّكْرَمُونَ ﴿٤٢﴾ فِى جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٤٣﴾ عَلَىٰ سُرُرٍ مُّتَقَٰبِلِينَ
﴿٤٤﴾ يُطَافُ عَلَيْهِم بِكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍۭ ﴿٤٥﴾ بَيْضَآءَ لَذَّةٍ لِّلشَّٰرِبِينَ
﴿٤٦﴾ لَا فِيهَا غَوْلٌ وَلَا هُمْ عَنْهَا يُنزَفُونَ ﴿٤٧﴾ وَعِندَهُمْ قَٰصِرَٰتُ
ٱلطَّرْفِ عِينٌ ﴿٤٨﴾ كَأَنَّهُنَّ بَيْضٌ مَّكْنُونٌ ﴿٤٩﴾ فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ
بَعْضٍ يَتَسَآءَلُونَ ﴿٥٠﴾ قَالَ قَآئِلٌ مِّنْهُمْ إِنِّى كَانَ لِى قَرِينٌ ﴿٥١﴾

٤٤٧

ئاوا بەمۆشریکان وتاوانباران دەکەین ﴿٣٥ إنهم كانوا إذا قيل لهم لا إله إلا الله يستكبرون﴾ چونکە ئەوان کاتێ پێیان گوترابا:هیچ پەرستراوێکی هەق نیە جگە لە(الله)، ئیبایان دەکرد وخۆیان زۆر بەزل دەزانی ﴿٣٦ ويقولون إنا لتاركوا آلهتنا لشاعر مجنون﴾ و دەشیانگوت:ئایائێمە بۆشاعیرێکی شێت ولێوە وەکو موحەممەد،واز لەخواکانمان بێنین؟! ﴿٣٧ بل جاء بالحق وصدق المرسلين﴾ خوا ڕەتیان دەداتەوەو دەفەرموێ: نەخێر، وا نیە وەك ئەوان پێیان وایە، بەڵکو ئەوبەهەق (واتە:بە قورئانەوە) هاتووەو، هەرچیشیهێناوە هەرراستەو، بڕواشی بەوپەیامبەرانە کردووە بەر لەخۆی هاتوون و، باسی ڕێگا و بەرنامەی حەقیان کردووە.

### تۆڵەی موشریکان و جەزای خوا پەرستان:

﴿٣٨ إنكم لذائقوا العذاب الأليم﴾ بێگومان ئێوە (ئەی پێشەوایانی شیرك وخوانەناسیی!) سزایەکی بەئێش دەچێژن ﴿٣٩ وما تجزون إلا ما كنتم تعملون﴾ دیارە کەهەر بەوکارانە سزاو تۆڵە دەدرێن لە دنیادا کردوتانن ﴿٤٠ إلا عباد الله المخلصين﴾ بەڵام بەندە یەکخواپەرستەکان ،لەو سزایە بەدوور دەبن و توێژینەوەیان لە تەکناکرێ ﴿٤١ أولئك لهم رزق معلوم﴾ ئەم بەندە خوا بەهەقناسانە, ڕۆزییەکی باش و تایبەتی وبێ‌شوماری کاتزانراویان بۆ هەیەو, هەرگیز لێشیان نابڕێ،وەك ئەفەرموێ: ﴿٤٢ فواكه وهم مكرمون﴾ میوەجاتی جۆراوجۆرە, ڕێز لێگیراوو ڕێزداریشن ﴿٤٣ في جنات النعيم﴾ لە چەند باخێکی پڕ لە نیعمەت ﴿٤٤ على سرر متقابلين﴾،لەسەر تەختان بەرامبەریەك دانیشتوون ﴿٤٥ يطاف عليهم بكأس من معين﴾ لەپێکی‌شەراب و بادەی چاوگی ڕەوان و لەبەر ڕۆیشتوو بە سەریاندا دەگێڕدرێ ﴿٤٦ بيضاء لذة للشاربين﴾ شەرابی ڕەنگ سپی، خۆشمەزە بۆ خۆرەوانی ﴿٤٧ لا فيها غول ولا هم ينزفون﴾ نە هیچ سەرئێشەو تێکچوونێکی تێدایە، نە عەقڵیشیان لا دەبرێ ﴿٤٨ وعندهم قاصرات الطرف عين﴾ وچەند هاوسەر ێکی چاوگەورەو چاو ڕەشیان لایە، کە جگە بۆ مێردەکانیان ئەوینیان بۆ کەس نیەو، بۆ هیچ کەسێکی دیکەش ناڕوانن ﴿٤٩ كأنهن بيض مكنون﴾ لووس وپاکژو سپی، هەر دەڵێیت: هێلکەی ناوهێلانەن و لەژێر باڵ و پەڕدا داپۆشراون و هەرگیز تۆزیان لێ نەنیشتووە و کەسێ دەستی لێنەداون.

### کۆبوونەوەی بەهەشتییەکان و گفتوگۆیەك:

﴿٥٠ فأقبل بعضهم على بعض يتساءلون﴾ ئەوجا بۆ وتوویژ ڕوو لە یەکتر دەکەن و لەیەکتر دەپرسن ودەکەونە یادی دنیاو خەڵکانێك بەیاد دەکەن: ﴿٥١ قال قائل منهم إني كان لي قرين﴾ یەکێکیان دەڵێ: بەراستیی من لەدنیادا هامدەم وهاونشینێکم هەبوو, نکوڵی زیندووبوونەوەی دەکرد ﴿٥٢ يقول إنك لمن المصدقين﴾ و دەیگوت: ئایا تۆش لەوانەیت باوەڕیان بەزیندوو بوونەوە هەیە؟! ﴿٥٣ إذا متنا وكنا ترابا وعظاما إنا لمدينون﴾ ئاخۆ - وەك ئێوە دەڵێن - کاتێ مردین و بووینە گڵ و چەند ئێسکێك زیندووئەکرێینەوەو پاداش ئەدرێینەوە؟! ﴿٥٤ قال هل أنتم مطلعون﴾ موسڵمانە بەهەشتیەکە لە هاوڕێ بەهەشتیەکانی خۆی دەپرسێ: ئایا ئێوە لەسەرەوە دەڕوانن، هیچ ئاگایەکتان لێی هەیە؟ ﴿٥٥ فاطلع فرآه في سواء الجحيم﴾ ئەوجا خۆی سەیر دەکا ددەبینێ لەناوەڕاستی دۆزەخدایە ﴿٥٦ قال تالله إن كنت لتردين﴾ بە شایەکامیەکەوە وتی: سوێند بەخوا، نزیك بوو منیش بخەیتە ناو دۆزەخەوەو وەك خۆت فریوم بدەیت ﴿٥٧ ولولا نعمة ربي لكنت من المحضرين﴾ و ئەگەر نیعمەتی چاکەی پەروەردگارم نەبوایە بە هیدایەت وپاراستن، منیش ئێستا لە ئامادەکراوانی ناو دۆزەخ ئەبووم ﴿٥٨ أفما نحن بميتين إلا موتتنا الأولى﴾ ئینجا بەهەشتیەکان لەناو خۆیاندا بۆخۆشی دەڵێن: ئەرێ ئێمە ئیتر نامرین, جگە لەمردنی پێشوومان؟ ﴿٥٩ وما نحن بمعذبين﴾ و هیچ سزایەکیش ئەدرێین؟ ﴿٦٠ إن هذا لهو الفوز العظيم﴾ بە ڕاستیی ئەمە کە خوا پێمانی

بەخشیوە, لەرێزو کەرامەتی بەهەشت,ئەوەیە بە ئامانج گەیشتنی گەورە ﴿٦١ لمثل هذا فلیعمل العاملون﴾ خودا دەەرموێ: دەبا تێکۆشەران بۆ گەیشتن بە ئامانجی ئاوا, هەوڵ بدەن و لێ بڕێن و کاربکەن لە دنیادا.

**دارە ژەقنەمووتەکەی دۆزەخ و یارانی:**

﴿٦٢ اذلك خیر نزلا أم شجرة الزقوم﴾ خوا ئەفەرموێ: دەئایا ئەونازو نیعمەتەی بەهەشتە چاکترە بۆ میوانداریی، یان دارەکەی ژەقنەمووت،واتە:یان درەختە نەفرەت لێکراوەکەی زەققوم؟! زەققوم: درەختێکی بچووکی بۆگەنی بەروبووتاڵە، لە (تیهامە)دا دەڕوێ و, خواردنی جەهەندەمیەکانە ﴿٦٣ إنا جعلناها فتنة للظالمین﴾ بەڕاستیی ئێمە کردوومانە بەتاقیکردنەوە بۆ موشریکان ,ئەوە بوو کاتێ باسی درەختی زەققوم کرابا، ئەیانوت: چۆن لەناو ئاگردا درەخت شین دەبێ؟! لەجێگایەکیتردا ئەفەرموێ: (وما جعلنا الرؤیا التی أریناك إلا فتنة للناس و الشجرة الملعونة فی القرآن ونخوفهم فما یزیدهم إلا طغیانا کبیرا) ١٧/٦٠ ﴿٦٤ إنها شجرة تخرج فی اصل الجحیم﴾ بەڕاستیی ئەوە درەختێکە لە بنی دۆزەخەوە دەرئەچێ ﴿٦٥ طلعها کأنه رؤس الشیاطین﴾ بەروبووم و خونچەی سەر لقەکانی هەردەڵێی سەروسەکوتی شەیاتینییە. کاتی خۆی عەرەبەکان شتی زۆر ناشیرینیان ئەشوبهاند بە کەللە سەری شەیتانەوە,بۆیە قورئانیش لە سەر زمانی ئەوان دێ و دەڵێ:بەروو بووکەی لەسەرو سەکوتی شەیاتین دەچێت ﴿٦٦ فإنهم لآکلون منها﴾ جا بەڕاستی ئەو دۆزەخیانە –بەناچاریی– لێی ئەخۆن ﴿فمالئون منها البطون﴾ جا ورگی خۆیانی لێپڕئەکەن، (لیس لهم طعام إلامن ضریع لایسمن ولا یغنی من جوع) ٨٨/٦–٧ بۆ دووپاتکردنەوەی ئەو مانایەیە. (ئیبن عەباس) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئەو ئایەتەی دەخوێندەوەو، پاشان دەیفەرموو: بەهەقیانەت لە خوا بترسن، چونکە بەڕاستی ئەگەر دڵۆپێك لە داری زەقووم بتکێنرێتە نێودەریاکانی دونیاوە، ئەوا ژیان و ژیواری سەرزەویی گشت تێك ئەدا لێیان، جا دەبێ حاڵی ئەو کەسە چۆن بێ، ئەوە خۆراکی بێ؟ تیرمیزیو نەسائییو ئیبنیماجە.﴿٦٧ ثم إن لهم علیها لشوبا من حمیم﴾ لەپاشان لەسەر ئەو خۆراکە خڵتەیەك لە ئاوێکی گەرمیان بۆ هەیەو,دەیکەن بەسەر زەقومەکەدا ﴿٦٨ ثم إن مرجعهم لإلی الجحیم﴾ پاشان بەڕاستیی گەڕانەوەشیان بۆ دۆزەخە ﴿٦٩ ثم إنهم الفوا آباءهم ضالین﴾ بۆیە ئەوسزایەش توندی ملیان کرا، چونکە بەڕاستیی ئەوانە باوو باپیرانی خۆیانیان بە گومڕاییو سەرلێشێواوی دی﴿٧٠ فهم علی آثارهم یهرعون﴾ جا ئەوانیش بێ لێکدانەوە لەدنیادا لە شوێنی ئەوان تاو دەدران ﴿٧١ ولقد ضل قبلهم أکثر الأولین﴾ وەنەبێ تەنها قورەیش سەریان لێ تێکچووبێت، بێگومان لە پێشیانەوە زۆرترینی پێشینان گومڕابوون و هاوەڵیان بۆ خوا دانا! ﴿٧٢ ولقد ارسلنا فیهم منذرین﴾ وبێگومان پەیامبەرانێکی زۆریشمان ناردە نێویان بۆترساندن و

الجزء الثالث والعشرون — سورة الصافات

يَقُولُ أَءِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُصَدِّقِينَ ﴿٥٢﴾ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا
لَمَدِينُونَ ﴿٥٣﴾ قَالَ هَلْ أَنتُم مُّطَّلِعُونَ ﴿٥٤﴾ فَٱطَّلَعَ فَرَءَاهُ فِى سَوَآءِ
ٱلْجَحِيمِ ﴿٥٥﴾ قَالَ تَٱللَّهِ إِن كِدتَّ لَتُرْدِينِ ﴿٥٦﴾ وَلَوْلَا نِعْمَةُ رَبِّى
لَكُنتُ مِنَ ٱلْمُحْضَرِينَ ﴿٥٧﴾ أَفَمَا نَحْنُ بِمَيِّتِينَ ﴿٥٨﴾ إِلَّا مَوْتَتَنَا
ٱلْأُولَىٰ وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴿٥٩﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٦٠﴾
لِمِثْلِ هَٰذَا فَلْيَعْمَلِ ٱلْعَٰمِلُونَ ﴿٦١﴾ أَذَٰلِكَ خَيْرٌ نُّزُلًا أَمْ شَجَرَةُ
ٱلزَّقُّومِ ﴿٦٢﴾ إِنَّا جَعَلْنَٰهَا فِتْنَةً لِّلظَّٰلِمِينَ ﴿٦٣﴾ إِنَّهَا شَجَرَةٌ
تَخْرُجُ فِىٓ أَصْلِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٦٤﴾ طَلْعُهَا كَأَنَّهُۥ رُءُوسُ ٱلشَّيَٰطِينِ
﴿٦٥﴾ فَإِنَّهُمْ لَءَاكِلُونَ مِنْهَا فَمَالِـُٔونَ مِنْهَا ٱلْبُطُونَ ﴿٦٦﴾ ثُمَّ إِنَّ لَهُمْ
عَلَيْهَا لَشَوْبًا مِّنْ حَمِيمٍ ﴿٦٧﴾ ثُمَّ إِنَّ مَرْجِعَهُمْ لَإِلَى ٱلْجَحِيمِ ﴿٦٨﴾
إِنَّهُمْ أَلْفَوْا۟ ءَابَآءَهُمْ ضَآلِّينَ ﴿٦٩﴾ فَهُمْ عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِمْ يُهْرَعُونَ ﴿٧٠﴾
وَلَقَدْ ضَلَّ قَبْلَهُمْ أَكْثَرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٧١﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا فِيهِم
مُّنذِرِينَ ﴿٧٢﴾ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴿٧٣﴾
إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٧٤﴾ وَلَقَدْ نَادَىٰنَا نُوحٌ فَلَنِعْمَ
ٱلْمُجِيبُونَ ﴿٧٥﴾ وَنَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥ مِنَ ٱلْكَرْبِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٧٦﴾

٤٤٨ وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُۥ

سەرکۆنەکردنیان، بەڵام ئامۆژگارییان وەرنەگرت ﴿ ٧٣ فانظر كيف كان عاقبة المنذرين﴾ جا بنواڕە لەدواجاردا بزانە پاشەڕۆژی ترسێنراوەکان چۆن بوو؟ ئایا خوا لە ڕیشەی نەهێنان؟ ﴿ ٧٤ إلا عباد الله المخلصين﴾ بەڵام بەندە پاکە هەڵبژێرراوەکانی خوا، ڕزگاریان بوو.

نووح و نەتەوەکەی:

﴿ ٧٥ ولقد نادانا نوح﴾ بێسۆ (نووح) یش هاواری بۆ هێناین و،داوای یارمەتی لێکردین بۆسەر گەلە خراپەکەی، ئەوجائێمەش وەڵاممان دایەوە ﴿ فلنعم المجيبون﴾ بەڕاستیی ئێمەش چاك وەڵام دەرەوە بووین، چونکە بە خێرایی بەدەمیەوەچووین وفریای کەوتین ﴿ ٧٦ ونجيناه وأهله من الكرب العظيم﴾ وخۆیو خانەوادەو خەڵکەهاودینەکانیمان لەوبەڵا گەورەیە ڕزگار کرد ﴿ ٧٧ وجعلنا ذريته هم الباقين﴾ و لەناو ئەو هەموو خەڵکەدا زاڕۆو نەوەکانی ئەومان هێشتەوە.دەڵێن:لەپیاوو لەژن تەنها هەشتا کەسێك باوەڕیان هێناودەرچوون، پاشان مرۆڤ بۆدوایی لەسێ کوڕەکەی نووح: (سام،حام،یافیس)، زاوزێیانکردووەو پەیدابوونەوە ﴿ ٧٨ وتركنا عليه في الآخرين﴾ وە لە گەلانی تری داهاتوویشدا سەناو ناوبانگی چاکمان بۆ هێشتەوە تاڕۆژی قیامەت ﴿ ٧٩ سلام على نوح في العالمين﴾ سڵاوو دروود بۆ سەرگیانی نوح لەسەراسەری دونیادا، ﴿ ٨٠ إنا كذلك نجزي المحسنين﴾ بەڕاستیی ئێمە ئاوا پاداشتی چاکەسازان ئەدەینەوە، واتە: بە ناوو شۆرەتی چاك ﴿ ٨١ إنه من عبادنا المؤمنين﴾ چونکە بەڕاستیی ئەو(نوح ﷺ) یەکێ بوو لە بەندە بڕوادارەکانم ﴿ ٨٢ ثم اغرقنا الآخرين﴾ لەپاشان خەڵکەکانی ترمان، ئەوانەیان بڕوایان نەهێنا نقومکرد.

وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُۥ هُمُ ٱلْبَاقِينَ ﴿٧٧﴾ وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِى ٱلْـَٔاخِرِينَ ﴿٧٨﴾ سَلَٰمٌ
عَلَىٰ نُوحٍ فِى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٧٩﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٨٠﴾ إِنَّهُۥ مِنْ
عِبَادِنَا ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٨١﴾ ثُمَّ أَغْرَقْنَا ٱلْـَٔاخَرِينَ ﴿٨٢﴾ ۞ وَإِنَّ مِن
شِيعَتِهِۦ لَإِبْرَٰهِيمَ ﴿٨٣﴾ إِذْ جَآءَ رَبَّهُۥ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴿٨٤﴾ إِذْ قَالَ
لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ مَاذَا تَعْبُدُونَ ﴿٨٥﴾ أَئِفْكًا ءَالِهَةً دُونَ ٱللَّهِ تُرِيدُونَ
﴿٨٦﴾ فَمَا ظَنُّكُم بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٧﴾ فَنَظَرَ نَظْرَةً فِى ٱلنُّجُومِ ﴿٨٨﴾
فَقَالَ إِنِّى سَقِيمٌ ﴿٨٩﴾ فَتَوَلَّوْا۟ عَنْهُ مُدْبِرِينَ ﴿٩٠﴾ فَرَاغَ إِلَىٰٓ ءَالِهَتِهِمْ
فَقَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ ﴿٩١﴾ مَا لَكُمْ لَا تَنطِقُونَ ﴿٩٢﴾ فَرَاغَ عَلَيْهِمْ ضَرْبًۢا
بِٱلْيَمِينِ ﴿٩٣﴾ فَأَقْبَلُوٓا۟ إِلَيْهِ يَزِفُّونَ ﴿٩٤﴾ قَالَ أَتَعْبُدُونَ مَا تَنْحِتُونَ
﴿٩٥﴾ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾ قَالُوا۟ ٱبْنُوا۟ لَهُۥ بُنْيَٰنًا فَأَلْقُوهُ
فِى ٱلْجَحِيمِ ﴿٩٧﴾ فَأَرَادُوا۟ بِهِۦ كَيْدًا فَجَعَلْنَٰهُمُ ٱلْأَسْفَلِينَ ﴿٩٨﴾
وَقَالَ إِنِّى ذَاهِبٌ إِلَىٰ رَبِّى سَيَهْدِينِ ﴿٩٩﴾ رَبِّ هَبْ لِى مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ
﴿١٠٠﴾ فَبَشَّرْنَٰهُ بِغُلَٰمٍ حَلِيمٍ ﴿١٠١﴾ فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ ٱلسَّعْىَ قَالَ
يَٰبُنَىَّ إِنِّىٓ أَرَىٰ فِى ٱلْمَنَامِ أَنِّىٓ أَذْبَحُكَ فَٱنظُرْ مَاذَا تَرَىٰ ۚ قَالَ
يَٰٓأَبَتِ ٱفْعَلْ مَا تُؤْمَرُ ۖ سَتَجِدُنِىٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٠٢﴾

ئیبراهیم و گەلەکەی:

دێتە سەرباسی چیرۆکەکەی ئیبراهیم ﷺ و ئەفەرموێ: ﴿ ٨٣ وإن من شيعته لإبراهيم﴾ بەڕاستی (ئیراهیم) یش (لە ئەسڵی دیندا) لە شوێنکەوتووانی نوح بوو، هەرچۆنێ نوح هەوڵی یەکتاپەرستی ئەداو توند بوو لەسەر چەسپاندنی ئاییتی خوا، ئیبراهیمیش هەروا ﴿ ٨٤ إذ جاء ربه بقلب سليم﴾ ئەو دەمەی کە بەدڵێکی ساغ و پاك ودوور لە شیرك هاتە پێشگای پەروەردگاری خۆی. (موحەممەدی ئیبن سیرین) دەڵێ: قەلبی (سەلیم) ئەوەیە: بزانێ هەر خوا هەقەو، هاتنی ڕۆژی قیامەتیش ڕاستە و، مردوانیش زیندو ئەکرێنەوە. (ئیبن ئەبی حاتم). ﴿ ٨٥ إذ قال لأبيه وقومه ماذا تعبدون﴾ کاتێ کە بە باوکی و، گەلەکەی خۆی گوت: چیە دەیپەرستن؟! ﴿ ٨٦ إفكا آلهة دون الله تريدون﴾ ئایا شتێکیدرۆو دەست هەڵبەست و ناڕەوا، چەندخوایەك لەباتی خوای هەق، دەخوازن بۆپەرستن؟! ﴿ ٨٧ فما ظنكم برب العالمين﴾ ئەرێ باوەڕتان بە پەروەردگاری جیهانەکان چیە؟ ﴿ ٨٨ فنظر نظرة في النجوم﴾ ئینجا ئیبراهیم تەماشایەکی ئەستێرەکانی کرد ﴿ ٨٩ فقال إني سقيم﴾ جاوتی: بەڕاستی من نەخۆشم، مەبەستی ئەوەبوو کە لەگەڵ

ئەواندا نەڕوا بۆ جەژنەکەیان,بەمەستی‌شکاندنی بتەکان بمێنێتەوە ﴿٩٠ فتولوا عنهم مدبرين﴾ ئینجا ڕوویان لێ وەرچەرخان و، پشتیان تێکردو گەڕانەوە بۆبارە ناهەموارو نالەبارەکەی خۆیان ﴿٩١ فراغ إلى آلهتهم فقال الا تأكلون﴾ ئینجا زۆر بەنهێنی و لەسەرخۆ چوویە بتخانەکەوەو ڕوویکردە بتەکان و بە گاڵتەوە وتی: ئایا ئێوە ناخۆن لەم خواردنە؟ ﴿٩٢ ما لكم لا تنطقون﴾ چیتانە، بۆ قسە ناکەن؟! ﴿٩٣ فراغ عليهم ضربا باليمين﴾ ئینجا لەسەرخۆ بەرەو ڕوویان ڕۆیشت وتوند بە دەستیی ڕاستیی مستێکی تێسرەواندن و، هەموویانی ورد و خاش کرد، بتە گەورەکە نەبێ ﴿٩٤ فأقبلوا إليه يزفون﴾ ئینجا خەڵکەکە گەڕانەوەوبە ڕەو (ئیبراهیم) بەچوستی چون , هەتا بزانن کێ بتەکانیانی شکاندووەوبەسەر یەکدا، بۆیە بەیەکتریان وت: بێ‌ئو نەبێ هەرئیبراهیم بووە، ئینجا سەرکۆنەیان کرد ﴿٩٥ قال اتعبدون ما تنحتون﴾ ئیبراهیمیش گوتی:ئاخۆ ئێوە شتێ دەپەرستن کە بە دەستی خۆتان ئەیتاشن؟! ﴿٩٦ والله خلقكم وما تعملون﴾ هەم خۆتان وهەم ئەو بتانە دروستیان دەکەن لە دارو بەرد، خوا بەدیهێناون، واتە:ئەو خوایە دەسەڵاتدارێکی وەهایە, ئەگەر بیەوێ ناهێڵێ ئێوە هیچ شتێ بکەن و، هێزو تواناتان لێدەسێنێتەوە. (قورتوبیی) ئەڵێ: (أى والله خلقكم و عملكم، وهذا مذهب أهل السنة: أن الأفعال خلق لله –عزوجل– و اكتساب للعباد، و في هذا إبطال مذهب القدرية و الجبرية). (ئەبووهوریرە) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((أن الله خالق كل صانع و صنعته)) أخرجه الحاكم فى الإيمان، و صححه على شرط مسلم. واتە: بێگومان خوا دروستکەری هەموو پیشەسازێك وپیشەکەیەتی. ﴿٩٧ قالوا ابنوا له بنيانا فألقوه فى الجحيم﴾ جا کە قسەیان بڕاو پەکیانکەوت، وتیان: شوورە بینایەکی بڵندی بۆساز بدەن و پڕی بکەن لە ئاگرو، ئەوساتێیفڕێ بدەن، ئەوانیش هەڵیانداو ئیبراهیمیش وتی: (حسبى الله ونعم الوكيل).﴿٩٨ فأرادو به كيدا﴾ جا ئەوان نیازو خەیاڵێکی خراپیان بەرامبەر بە ئیبراهیم کردو ویستیان بیسوتێنن ﴿فجعلناهم الأسفلين﴾ جا ئێمەش وەژێرمان خستن,واتە: ئاگرەکەمان فێنککردەوەو، هێزی سوتاندنمان تیا نەهێشت و هەوڵەکانیانمان باتڵ وپووچەڵکردەوە. تەفسیری (نامیی) بەرگی شەش، لاپەڕە (١٦٥) چاپی (١٩٨٤)ز دەڵێت: ئەو ئاگرەیە لە (دەشتی بیتوێن)ی سەربە قەزای (ڕانیە)ی سەربەپارێزگای سلێمانی بوو، لەوێدابووئیبراهیمیان خستە ناو ئاگرەکەوە.! بەڵام نازانم تا چ ئەندازە ئەوە دەگونجێت و سەرچاوەکەی چیە؟.

**کۆچەکەی ئیبراهیم و ئەزمواندنی بەسەربڕینی ئیسماعیل:**

﴿٩٩ وقال إنى ذاهب إلى ربى سيهدين﴾، ئیبراهیم کەنائومێدبوو لەئیمانی قەومەکەی گوتی: کەوابو من کۆچ دەکەم بۆ ئەو شوێنە خوا فەرمانی پێکردووم, هەر ئەویش ڕێنماییم دەکات بۆی، جا هەر لەسەر ئەو دڵنیاییە، خۆیی و(لووت)ی برازای وخاتوو (سارە)ی خێزانی (عێراق)یان جێهێشت و بەرەو وڵاتی شام بەڕێکەوتن، پاشان لەوێش کارەکەیان مەیسەر نەبوو بەرەو (فەلەستین) ڕۆشتن، بۆدواتریش چوون بۆ (میسر). ﴿١٠٠ رب هب لى من الصالحين﴾ جا کە گەلەکەی بەجێهێشت" هەستی بەئاوارەیی و بێ کەسی کرد، بۆیە فەرمووی: پەروەردگارم! بەشکوم منداڵێکی نێرینەی ساڵحم پێببەخشیت ﴿١٠١ فبشرناه بغلام حليم﴾ ئینجا ئێمەش موژدەمان پێدا بەکوڕێکی بەئارام و هێمن، ئەو کوڕەش –وەك ڕاڤەکەرانی قورئان دەڵێن– ئیسماعیل بوو ﴿١٠٢ فلما بلغ معه السعى﴾ جاکاتێ گەیشتە تەمەنی کاروتێکۆشان وڕۆشتن لە گەڵ باوکیدا ﴿قال يا بنى إنى أرى فى المنام انى اذبحك﴾ ئیبراهیم وتی: کوڕەچکۆلەکەم! بەڕاستیی من لەخەونمدا دیتم کە دەبێ تۆ سەببڕم ﴿فانظر ماذا ترى﴾ جا بنواڕە چی دەبینی؟ واتە:چی بەباش دەبینی, سەربڕینت یان نا؟ ﴿قال يا ابت افعل ما تؤمر﴾ ئیسماعیل وتی: بابە! هەرچیت پێسپێرراوە بیکە ﴿ستجدنى إن شاء الله من الصابرين﴾ دەمبینی بەخواستی خوا لە خۆگرانم. بەڵێ.. ئیسماعیل

-علیه السلام- بەڵێنەکەی خۆی بردە سەرو راستی فەرموو, بۆیە خوایش شایەدی بۆداو فەرمووی: (واذکر فی الکتاب اسماعیل إنه کان صادق الوعد وکان رسولا نبیا)١٩/٥٤. ﴿١٠٣ فلما أسلما وتله للجبین﴾ جا کاتێ هەردوو (باوك و کوڕ) ملکەچی فەرمانی خوا بوون و، ئیبراهیم ئیسماعیلی بە رووداخست بۆ سەر برین ﴿١٠٤ ونادیناه أن یا إبراهیم قد صدقت الرؤیا﴾ لەو حەلەدا ئیمەش بانگمان لە ئیبراهیم کردو وتمان: ئەی ئیبراهیم! بەراستیی خەونەکەتت بەدی هێنا و جێبەجێت کرد ﴿١٠٥ إنا کذلك نجزی المحسنین﴾ بەڕاستیی ئێمە ئاوا پاداشی چاککاران ئەدەینەوە,وەك پاداشی ئیبراهیممان دایەوە، ئەوەیە کە خوا ئەفەرمووێ: (ومن یتق الله یجعل لە مخرجا ویرزقه من حیث لا یحتسب..)٦٥/٢-٣. ﴿١٠٦ إن هذا لهو البلاء المبین﴾ بەڕاستیی ئائەمە ئەوتاقیکردنەوە ئاشکرایە بوو، ئیبراهیم وئیسماعیلمان پێ تاقیکردنەوە ﴿١٠٧ وفدیناه بذبح عظیم﴾ وە ئەومان بە قۆچێکی گەورە کرییەوەوبریتیدا, زاناکانی تەفسیر دەڵێن: بەرانێکی سەر بڕی لە فیدیەی ئیسماعیلدا/ سەلامیان لە سەربێ ﴿١٠٨ وترکنا علیه فی الآخرین﴾ وەناوو شۆرەتی چاکەیمان بۆ هەتا هەتایی- لە نێو نەوەی ئایندەدا- بۆهێشتەوە ﴿١٠٩ سلام علی إبراهیم﴾ سڵاوو درودی نەبراوە بۆ ئیبراهیم ﴿١١٠ کذلك نجزی المحسنین﴾ ئێمە ئاوا پاداشتی چاککاران ئەدەین ﴿١١١ إنه من عبادنا المؤمنین﴾ بەڕاستیی ئەو یەکێ بوو لەو بەندانەمان, بڕوای بتەویان بوو ﴿١١٢ وبشرناه بإسحاق نبیا من الصالحین﴾ دوای ئەو رووداوەش مۆژدەی لە دایك بوونی(ئیسحاق)یشمان پێدا, کە پەیامبەرێ ئەبێ لە چاکان ﴿١١٣ وبارکنا علیه وعلی إسحاق﴾ خێرو بێری دونیاو قیامەتمان بەسەر ئیبراهیم و ئیسحاقدا رشت ﴿ومن ذریتهما محسن وظالم لنفسه مبین﴾ جا لەگەڵ ئەوەشدا لەنێو نەوەکانیاندا خەڵکانی چاککارو، ستەمکار لە خۆهەبوون بە ئاشکرا.

الجزء الثالث والعشرون — سورة الصافات

فَلَمَّآ أَسۡلَمَا وَتَلَّهُۥ لِلۡجَبِينِ ﴿١٠٣﴾ وَنَٰدَيۡنَٰهُ أَن يَٰٓإِبۡرَٰهِيمُ ﴿١٠٤﴾ قَدۡ
صَدَّقۡتَ ٱلرُّءۡيَآۚ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٠٥﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ
ٱلۡبَلَٰٓؤُاْ ٱلۡمُبِينُ ﴿١٠٦﴾ وَفَدَيۡنَٰهُ بِذِبۡحٍ عَظِيمٖ ﴿١٠٧﴾ وَتَرَكۡنَا عَلَيۡهِ فِي
ٱلۡأٓخِرِينَ ﴿١٠٨﴾ سَلَٰمٌ عَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ ﴿١٠٩﴾ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ
﴿١١٠﴾ إِنَّهُۥ مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١١١﴾ وَبَشَّرۡنَٰهُ بِإِسۡحَٰقَ نَبِيّٗا مِّنَ
ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١١٢﴾ وَبَٰرَكۡنَا عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ إِسۡحَٰقَۚ وَمِن ذُرِّيَّتِهِمَا
مُحۡسِنٞ وَظَالِمٞ لِّنَفۡسِهِۦ مُبِينٞ ﴿١١٣﴾ وَلَقَدۡ مَنَنَّا عَلَىٰ مُوسَىٰ
وَهَٰرُونَ ﴿١١٤﴾ وَنَجَّيۡنَٰهُمَا وَقَوۡمَهُمَا مِنَ ٱلۡكَرۡبِ ٱلۡعَظِيمِ
﴿١١٥﴾ وَنَصَرۡنَٰهُمۡ فَكَانُواْ هُمُ ٱلۡغَٰلِبِينَ ﴿١١٦﴾ وَءَاتَيۡنَٰهُمَا ٱلۡكِتَٰبَ
ٱلۡمُسۡتَبِينَ ﴿١١٧﴾ وَهَدَيۡنَٰهُمَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ﴿١١٨﴾ وَتَرَكۡنَا
عَلَيۡهِمَا فِي ٱلۡأٓخِرِينَ ﴿١١٩﴾ سَلَٰمٌ عَلَىٰ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ
﴿١٢٠﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٢١﴾ إِنَّهُمَا مِنۡ
عِبَادِنَا ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١٢٢﴾ وَإِنَّ إِلۡيَاسَ لَمِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿١٢٣﴾
إِذۡ قَالَ لِقَوۡمِهِۦٓ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٢٤﴾ أَتَدۡعُونَ بَعۡلٗا وَتَذَرُونَ أَحۡسَنَ
ٱلۡخَٰلِقِينَ ﴿١٢٥﴾ ٱللَّهَ رَبَّكُمۡ وَرَبَّ ءَابَآئِكُمُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٢٦﴾

٤٥٠ — فكذبوه فإنهم

جا دوای داستانی (ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق)، بەکورتیی داستانی هەندێ لەپەیامبەرانیتر دەکات، وەك ئەفەرمووێ: ﴿١١٤ ولقد مننا علی موسی وهارون﴾ بێگومان ئێمە منەتمان نا بەسەر موساو هارون دا، بە پەیامبەرایەتی ونیعمەتی دیکە ,ئایەتی: (ولقد آتینا موسی وهارون الفرقان وضیاء..)٢١/٤٨. ئەو نیعمەتەی باسکردووە. ﴿١١٥ ونجیناهما وقومهما من الکرب العظیم﴾ خۆیان و گەلەکەیانمان لەو چۆرتم و بەڵاو نەگبەتیە گەورەیە رزگار کرد , واتە: لەژێر دەستەیی‌و ستەمی فیرعەون ﴿١١٦ ونصرناهم فکانوا هم الغالبین﴾ بۆ خۆمان وەموساو هارون و بەنی ئیسرائیلمان یارمەتیداو،ئینجا زاڵبوون و سەرکەوتن بە سەردوژمنەکانیاندا , ئەمەش پاش ئەوە بوو کە چەندان ساڵ بوو لەژێر دەستی فیرعەوندا ئەیان ناڵاند ﴿١١٧ وآتیناهما الکتاب المستبین﴾ ئونامە روونکەرەوەکەشمان (تەورات) پێدان. ﴿١١٨ وهدیناهما الصراط المستقیم﴾ وە رێی راستەکەشمان نیشاندان ﴿١١٩

﴿وتركنا عليهما فی الآخرين﴾ وناووشۆرەتی چاکەیانمان بۆ هەتا هەتایی لەنێو نەوەی ئایندەدا هێشتەوە ﴿[١٢٠] سلام
علی موسی وهارون﴾، سڵاوو درود بۆ سەرگیانی مووساو هارون بەهەتا هەتایی ﴿[١٢١] إنا كذلك نجزی المحسنين﴾
بەڕاستیی ئێمە ئاوا پادشتی چاککاران ئەدەینەوە ﴿[١٢٢] إنهما من عبادنا المؤمنين﴾ چونکە بەراستیی هەردووکیان
(موساو هاروون) لەبەندە بڕوادارەکانمان بوون.

## یادی ئیلیاسی پێغەمبەر ﷺ:

﴿[١٢٣] وإن إلياس لمن المرسلين﴾ بێگومان (ئیلیاس) ی کوڕی (یاسین) -وەچەزای هاروونی برای موسا- یەکێ
لە پەیامبەران بوو,خوا ناردی بۆ نێو گەلێك کە لەوڵاتی (سوریە)دا بتێکیان بەناوی (بەعل)ەوە ئەپەرست، ئێستایش
شوێنەواری شاری (بعلبك) هەر دیارە.﴿[١٢٤] إذ قال لقومه الا
تتقون﴾ کاتێ رۆشت بەگەلەکەی خۆی وت: بۆ چی لەخوا
ناترسن؟ ﴿[١٢٥] اتدعون بعلا وتذرون أحسن الخالقين﴾، ئایا
بتی (بعل) ئەپەرستن و، دەست لەچاکترین و جوانترین
دروستکاران هەڵئەگرن؟! ﴿[١٢٦] الله ربكم ورب آبائكم
الأولين﴾ ئەو خوایە (الله)، کەپەروەردگاری ئێوەو
پەروەردگاری باوو باپیرە پێشووەکانتانە ﴿[١٢٧] فكذبوه فإنهم
لمحضرون﴾ دەرەنجام بڕوایان پێ نەهێناو بەدرۆیان
زنیانکرد، جا لە تۆڵەدا لەناو دۆزەخدا ئامادە دەکرێن بۆ
سزا ﴿إلا عباد الله المخلصين﴾ جگە لەبەندە پاکە
دڵسۆزەکانی خوا ﴿[١٢٩] وتركنا عليه فی الآخرين﴾ وە نێومان
بەچاکیی و، پاکیی لەناو گەلانی پاش ئەواندا هێشتەوە
﴿[١٣٠] سلام علی إل ياسين﴾ سڵاوو درود بەهەتا هەتایی بۆ
(ئیلیاس) خۆیی و, بۆ شوێنکەوتووەکانی ﴿[١٣١] إنا كذلك
نجزی المحسنين﴾ بەراستیی ئێمە پاداشی چاککاران ئاوا
ئەدەینەوە ﴿[١٣٢] إنه من عبادنا المؤمنين﴾ چونکە بەڕاستیی
ئەو یەکێ بوو لەبەندە بڕوادارەکانمان.

الجزء الثالث والعشرون — سورة الصافات

فَكَذَّبُوهُ فَإِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ ﴿١٢٧﴾ إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿١٢٨﴾
وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِى ٱلْـَٔاخِرِينَ ﴿١٢٩﴾ سَلَٰمٌ عَلَىٰٓ إِلْ يَاسِينَ ﴿١٣٠﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ
نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٣١﴾ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٣٢﴾ وَإِنَّ لُوطًا
لَّمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٣٣﴾ إِذْ نَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ أَجْمَعِينَ ﴿١٣٤﴾ إِلَّا عَجُوزًا
فِى ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿١٣٥﴾ ثُمَّ دَمَّرْنَا ٱلْـَٔاخَرِينَ ﴿١٣٦﴾ وَإِنَّكُمْ لَتَمُرُّونَ عَلَيْهِم
مُّصْبِحِينَ ﴿١٣٧﴾ وَبِٱلَّيْلِ ۗ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٣٨﴾ وَإِنَّ يُونُسَ لَمِنَ
ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٣٩﴾ إِذْ أَبَقَ إِلَى ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ ﴿١٤٠﴾ فَسَاهَمَ فَكَانَ
مِنَ ٱلْمُدْحَضِينَ ﴿١٤١﴾ فَٱلْتَقَمَهُ ٱلْحُوتُ وَهُوَ مُلِيمٌ ﴿١٤٢﴾ فَلَوْلَآ أَنَّهُۥ
كَانَ مِنَ ٱلْمُسَبِّحِينَ ﴿١٤٣﴾ لَلَبِثَ فِى بَطْنِهِۦٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٤٤﴾
الحزب ٤٦ ۞ فَنَبَذْنَٰهُ بِٱلْعَرَآءِ وَهُوَ سَقِيمٌ ﴿١٤٥﴾ وَأَنۢبَتْنَا عَلَيْهِ شَجَرَةً
مِّن يَقْطِينٍ ﴿١٤٦﴾ وَأَرْسَلْنَٰهُ إِلَىٰ مِاْئَةِ أَلْفٍ أَوْ يَزِيدُونَ ﴿١٤٧﴾
فَـَٔامَنُوا۟ فَمَتَّعْنَٰهُمْ إِلَىٰ حِينٍ ﴿١٤٨﴾ فَٱسْتَفْتِهِمْ أَلِرَبِّكَ ٱلْبَنَاتُ
وَلَهُمُ ٱلْبَنُونَ ﴿١٤٩﴾ أَمْ خَلَقْنَا ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ إِنَٰثًا وَهُمْ
شَٰهِدُونَ ﴿١٥٠﴾ أَلَآ إِنَّهُم مِّنْ إِفْكِهِمْ لَيَقُولُونَ ﴿١٥١﴾ وَلَدَ
ٱللَّهُ وَإِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴿١٥٢﴾ أَصْطَفَى ٱلْبَنَاتِ عَلَى ٱلْبَنِينَ ﴿١٥٣﴾

٤٥١

## لووطیش یەکێکە لە پێغەمبەران:

لەم ئایەتانەشدا تیشکێکیش ئەهاوێتە سەر (لووط) و ئەفەرمووێ: ﴿[١٣٣] وإن لوطا لمن المرسلن﴾ بەڕاستیی
(لووت)یش هەر لەپەیامبەران بوو ﴿[١٣٤] إذ نجيناه وأهله أجمعين﴾ کاتێ خۆی و دووکچەکە ی و
شوێنکەتووەکانیانمان رزگار کرد لە سزاکە، پاش ئەوەکە هۆزەکەی دەستیان کرد بەکاری دزێوو زۆر نابەجێ و
ناشیرین. ﴿[١٣٥] إلا عجوزا فی الغابرين﴾ مەگەر پیرەژنێك -ژنەکەی خۆی - لە ناوبە جێماوەکاندا, ئەو مایەوەو
بەسەرنویشتی ئەوان گەیشت ﴿[١٣٦] ثم دمرنا الآخرين﴾ پاشان خەڵکەکەیترمان هەموو بەتوندی لەناوبرد, واتە:
شارو گوندەکەیمان سەروخوار کرد ﴿[١٣٧] وإنكم لتمرون عليهم مصبحين * [١٣٨] وبالليل﴾ وە بەڕاستیی ئێوەش ئەی

قورەیش! بەبەیانیان و ئێواران لەکەناری گوندو شارە وێرانکراوەکانیانەوە تێئەپەڕن و،بەچاوی خۆتان گوندەکانیان ئەبینن کە چۆن وێرانکراون! ﴿أفلا تعقلون﴾ دەئایا تێناگەن و ئامۆژگاری وەرناگرن؟.

**بەسەرهاتەکەی یونس ﷺ:**

﴿١٣٩ وإن یونس لمن المرسلین﴾ بێگومان (یونس)یش یەکێك بوو لە پەیامبەران ﴿١٤٠ إذ أبق إلى الفلك المشحون﴾ کاتێ کە هەڵهات و چووە ناو کەشتیە پڕەکەوە ﴿١٤١ فساهم فکان من المدحضین﴾ ئنجا کاتێ خەریکبوو کەشتییەکە نقوم ببێ، لەناویەکتردا پشکیان هاویشت کە: هەرکەسێك ناوی دەرچێ دەبێ بیخەنە ناوئاوەکەوە، بۆ بارسووکی کەشتیەکە، ئەویش لەپشك خستن بەشداربوو, ئنجا گەڕا لە خلیسکاوان و, قورعە بۆ دەرنەچووان و, خرایە ناو ئاوەکەوە ﴿١٤٢ فالتقمه الحوت وهو ملیم﴾ ئینجا ماسییەکی گەورەو زەبەلاح (نەهەنگ) هەڵیلووشی و،خۆی لۆمەو سەرکۆنە دەکرد ﴿١٤٣ فلولا انه کان من المسبحین﴾ ئینجا ئەگەرئەو بە ڕاستیی لەیادکارانی خوا نەبوایە ﴿١٤٤ للبث فی بطنه إلى یوم یبعثون﴾ ئەوا تا ڕۆژی زیندووبوونەوە لەسکی ماسییەکەدا ئەمایەوە, بەڵام چونکە تەسبیحی خوای زۆر ئەکرد: ﴿١٤٥ فنبذناه بالعراء وهو سقیم﴾ هەڵماندایە سەرزەوییەکی چۆڵ و وشك و خاڵی لەداروردەخت و گیاو ڕووەك,کە نەخۆش وناساغیش بوو ﴿١٤٦ وانبتنا علیه شجرة من یقطین﴾ ئەوسا بڕکەی کوولەکەی گەورەمان لەلا ڕواند, بۆ ئەوەی بەگەڵاپانەکانی سێبەری بۆ بکات, لەولایشەوە وەك دەڵێن: گەڵای کولەکە ,مێش ومەگەزی لێنانیشێ. جەماوەری (سەلەف) دەڵێن: (یەقطین) کوولەکەیە، پێغەمبەریش ﷺ لەناو خواردنەکاندا,حەزی لە کولەکە کردووە، (سەعیدی کوڕی جوبەیر) دەڵێ: (کل شجرة لا ساق لها فهی من الیقطین) ,واتە: گشت درەختێکی بێ ساق ولاق، پێی دەڵێن (یە قطین) ﴿١٤٧ وارسلناه إلى مأة ألف أو یزیدون﴾ وپاشان ناردمانەوە بۆ لای سەدهەزار کەسیی، یان زیاتر. (ئیبن عەباس) دەڵێ: (١٢٠-١٧٠) هەزار کەس بوون, وە لە (نەینەوا)ی (موصل) دائەنیشتن. ﴿١٤٨ فآمنوا فمتعناهم إلى حین﴾ ئینجا بەدەرچوونی (یونس) ﷺ ترسیان لێنیشت کە خوا سزایان بدات، بۆیە هەموو باروحاڵیان گۆڕاو بڕوایان هێنا، جائێمەیش تاکاتێکی دیاریکراو نازونیعمەتمان پێدان وهێشتماننەوە.

**کیژ بۆ خوا دادەنێن و, بۆ خۆشیان کوڕ!:**

لەم چەند ئایەتەدا دێتە سەر ئەو باسە کە بێ باوەڕەکان ئەوەندە ساویلکەو نەفام بوون، بۆ خۆیان ڕازی نەبوون کچیان ببێ کەچی ئەیانوت: فریشتە کچی خوان! جا بۆئەوە خوا ئەفەرمووێ: ﴿١٤٩ فاستفتهم ألربك البنات ولهم البنون﴾ جا تۆ لەوانە بپرسە: ئایا کچان بۆ پەروەردگارتەو، کوڕانیش بۆ ئەوانە؟. ئایەتی: (سبحانه ولهم مایشتهون).. یان ئایەتی: (وإذا بشر أحدهم بالأنثى ظل وجهه مسودا وهو کظیم) بۆ ئەو هەقیقەتەیە. ﴿١٥٠ أم خلقنا الملائکة إناثا وهم شاهدون﴾ یاخۆ ئەوان لەوێ بوون ئێمە فریشتەکانمان بەمێ دروستکرد، وا ئەڵێن فریشتە مێن و کچی خوان! ﴿١٥١ الا إنهم من إفکهم لیقولون * ١٥٢ ولدالله﴾ هۆشیاربن! بەڕاستیی ئەو بێ بڕوایانە هەر بەدرۆی خۆیان ئەڵێن: خوا منداڵی بووە! ﴿وإنهم لکاذبون﴾ بەڕاستیی ئەوان درۆزنن ﴿١٥٣ أصطفى البنات على البنین﴾ ئایا خوا کچانی هەڵبژاردووە بەسەر کوڕاندا؟! ﴿١٥٤ مالکم کیف تحکمون﴾ چیتانە بڕیاری وا ئەدەن؟! ئێجگار نەفامانەو ساویلکانەیە بڕیارەکەتان ﴿١٥٥ افلا تذکرون﴾ دەئایا بیرناکەنەوە؟ تا بزانن چ هەڵەیەکی گەورەتان کردووە لەدانانی منداڵ بۆ خوا ﴿١٥٦ أم لکم سلطان مبین﴾ یاخۆ بەڵگەیەکی ئاشکراتان هەیە لەو بارەوە؟ ﴿١٥٧ فأتوا بکتابکم إن کنتم صادقین﴾ جا فەرموون بەڵگەنامەکەتان بێنن ئەگەر ئێوە ڕاست ئەکەن لەداواکەتاندا ﴿١٥٨ وجعلوا بینه وبین الجنة

نسبا﴾ هاوبەشدانەرەکان لەنێوان خواو فریشتەدا خزمایەتیان دانابوو، کاتێ ئەیانوت: فریشتە کچی خوان! ﴿ولقد علمت الجنة أنهم لمحضرون﴾ و بەهەقیقەت فریشتەکانیش باش دەزانن کە ئەوانە ئەو قسەیە ئەکەن لەدۆزەخدا ئامادەی سزا دەکرێن ﴿[١٥٩] سبحان الله عما یصفون﴾پاك وخاوێن وبێگەردە خوا لەوشتانەی ئەوان پێوەی ئەلکێنن و پەسنی ئەوی پێدەکەن ﴿[١٦٠] إلا عباد الله المخلصین﴾ بەڵام بەندە پاکە دڵسۆزەکانی خوا، رزگار دەبن لە ئاگرو، ئامادەی سزاش ناکرێن.

**گومڕاتر لە موشریك ئەوەیە باوەڕی پێدەکا:**

﴿[١٦١] فإنكم وما تعبدون﴾ جا بەڕاستیی ئێوەو ئەو بتانەش دەیانپەرستن ﴿[١٦٢] ما انتم علیه بفاتنین﴾ ئەوە نین بتوانن کەس لەسەر خودا گومڕا بکەن ﴿[١٦٣] إلا من هو صال الجحیم﴾ مەگەر کەسێك کە بڕیاری خوای لەسەر بێ"بۆ سووتان بخرێنرێتە ناو دۆزەخەوە ﴿[١٦٤] وما منا إلا له مقام معلوم﴾ وە فریشتەکان ئەڵێن هەموو کەسێکی ئێمە مەقامێکی دیاریکراوی خۆی هەیە ﴿[١٦٥] وإنا لنحن الصافون﴾ دەشڵێن بێگومان ئێمەین بۆ جێبەجێکردنی فەرمانەکانی خوا بەریز دەوەستین ﴿[١٦٦] وإنا لنحن المسبحون﴾ و بەڕاستیی هەر ئێمەشین لە وتنی پاك وخاوێنی ئەو راناوەستین ﴿[١٦٧] وإن كانوا لیقولون * [١٦٨] لو أن عندنا ذكرا من الأولین﴾ بەڕاستیی بێ بڕوایانی قورەیش پێش هاتنی پێغەمبەر ﷺ ئەیانوت: ئەگەر ئێمەش لەلایەن پێشینانەوە کتێبی خۆمان بۆ جێمابا "وەکو تەورات و ئنجیل" ﴿[١٦٩] لكنا عباد الله المخلصین﴾ ئێستا ئێمەش لەبەندە پاك و پاڵێوراوەکانی خوا دەبووین ﴿[١٧٠] فكفروا به﴾ کەچی کاتێ قورئان هات پێی کافرو بێ بڕوا بوون!! ﴿فسوف یعلمون﴾ ئینجا لەمەولا دەزانن ئەنجامی بێ بڕوایی خۆیان.

الجزء الثالث والعشرون — سورة الصافات

مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿١٥٤﴾ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿١٥٥﴾ أَمْ لَكُمْ سُلْطَانٌ مُّبِينٌ ﴿١٥٦﴾ فَأْتُوا بِكِتَابِكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿١٥٧﴾ وَجَعَلُوا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجِنَّةِ نَسَبًا ۚ وَلَقَدْ عَلِمَتِ الْجِنَّةُ إِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ ﴿١٥٨﴾ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٥٩﴾ إِلَّا عِبَادَ اللَّهِ الْمُخْلَصِينَ ﴿١٦٠﴾ فَإِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ ﴿١٦١﴾ مَا أَنتُمْ عَلَيْهِ بِفَاتِنِينَ ﴿١٦٢﴾ إِلَّا مَنْ هُوَ صَالِ الْجَحِيمِ ﴿١٦٣﴾ وَمَا مِنَّا إِلَّا لَهُ مَقَامٌ مَّعْلُومٌ ﴿١٦٤﴾ وَإِنَّا لَنَحْنُ الصَّافُّونَ ﴿١٦٥﴾ وَإِنَّا لَنَحْنُ الْمُسَبِّحُونَ ﴿١٦٦﴾ وَإِن كَانُوا لَيَقُولُونَ ﴿١٦٧﴾ لَوْ أَنَّ عِندَنَا ذِكْرًا مِّنَ الْأَوَّلِينَ ﴿١٦٨﴾ لَكُنَّا عِبَادَ اللَّهِ الْمُخْلَصِينَ ﴿١٦٩﴾ فَكَفَرُوا بِهِ ۖ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿١٧٠﴾ وَلَقَدْ سَبَقَتْ كَلِمَتُنَا لِعِبَادِنَا الْمُرْسَلِينَ ﴿١٧١﴾ إِنَّهُمْ لَهُمُ الْمَنصُورُونَ ﴿١٧٢﴾ وَإِنَّ جُندَنَا لَهُمُ الْغَالِبُونَ ﴿١٧٣﴾ فَتَوَلَّ عَنْهُمْ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿١٧٤﴾ وَأَبْصِرْهُمْ فَسَوْفَ يُبْصِرُونَ ﴿١٧٥﴾ أَفَبِعَذَابِنَا يَسْتَعْجِلُونَ ﴿١٧٦﴾ فَإِذَا نَزَلَ بِسَاحَتِهِمْ فَسَاءَ صَبَاحُ الْمُنذَرِينَ ﴿١٧٧﴾ وَتَوَلَّ عَنْهُمْ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿١٧٨﴾ وَأَبْصِرْ فَسَوْفَ يُبْصِرُونَ ﴿١٧٩﴾ سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٨٠﴾ وَسَلَامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ ﴿١٨١﴾ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٨٢﴾

ترتيبها ٣٨ — سُورَةُ صٓ — آياتها ٨٨

ص وَالْقُرْءَانِ — ٤٥٢

**سەرکەوتنی پێغەمبەران براوەتەوە:**

﴿[١٧١] ولقد سبقت كلمتنا لعبادنا المرسلین﴾ بەڕاستیی لە بابەت بەندە نێرراوەکانمانەوە بڕیارمان دەرچووە ﴿[١٧٢] إنهم لهم المنصورون﴾ کە بەڕاستیی هەرئەوان و شوێنکەوتووەکانیان یارمەتی دەدرێن هەم بەبەڵگە، هەم لەجەنگدا. ﴿[١٧٣] وإن جندنا لهم الغالبون﴾ بێگومانیشە هەر لەشکری خوا زاڵ و سەرکەوتووە بەسەر دوژمناندا.

بەڵێ بەشێوەیەکی گشتیی ئاوایە هەر عەقیدەو بیروباوەڕی موسڵمان سەر کەوتووە، وە بیرو بۆچوونەکانی دوژمن باتڵ وپووچەڵ بووە، ئەگەرچی لەهەندێ جێگاشدا بەرواڵەت دوژمن سەرکەوێ، چونکە خوا ئەیەوێ موسڵمانەکان پێبگەیەنێ و بیانگەیەنێتە پلەی شیاوی خۆیان بۆ هەڵگرتنی ئەو بیرو باوەڕە. ئایەتی (كتب الله لأغلبن أنا ورسلي إن الله قوی عزیز) ٢١/٥٨. وە ئایەتی: (إنا لننصر رسلنا والذین آمنوا فی الحیاة الدنیا ویوم یقوم الأشهاد) ٥١/٤٠.

ئەو ڕاستییەیە دەسەلمێنێ. ﴿١٧٤ فتول عنهم حتى حين﴾ دەسا تۆش بۆ ماوەیەکی کەم ڕوویان لێوەرگێڕە تا بڕیاری جیهاد دەدرێ ﴿١٧٥ وابصرهم فسوف يبصرون﴾ جا کاریان ببینەو سەیریان بکە کاتێ سزا دێتە سەریان، وە لە ئایندەدا پیرۆزی تۆو موسڵمانان و شکستی خۆیان و بێ بڕوایان دەبینن ﴿١٧٦ افبعذابنا يستعجلون﴾ ئایا بە هاتنی سزامان پەلە ئەکەن؟! ﴿١٧٧ فإذا نزل بساحتهم فساء صباح المنذرين﴾ هەر پێش دێت، جا کاتێك ئەوسزایە دابەزییە بەر دەرکی ماڵەکانیان، ئەوسا سبەینێی ترسێنراوەکان شوم وخراپ ئەبێ، واتە: ڕۆژێکی سەخت ورەشیان ئەبێ. ئیمامی (بوخاریی و موسلیم) دەڵێن: کاتێ پێغەمبەر ﷺ لە (خەیبەر)دا ڕۆژی کردەوە دیتی وا جولەکە بەتەورو بێڵ و خاکەنازەوە دەردەچن بۆ کشتوکاڵ و مەزراکانیان و، کاتێکیش سوپاکەی ئەویان دیت، وتیان: سوێند بەخوا وا موحەممەد خۆی و سوپاکەی هات –پێغەمبەریش– ﷺ فەرمووی: ((الله اكبر خربت خيبر، إذا نزلنا إنا بساحة قوم فساء صباح المنذرين)). واتە: خوا لەهەمووان گەورەترە، خەیبەر وێران دەبێ، هەرکاتێکیش ئێمە دەمی دەرگای هۆزی دوژمن بگرین، زۆر خراپ ئەبێ بەیانی ئەو ڕۆژەی ترسێنراوان؟! ﴿١٧٨ وتول عنهم حتى حين﴾ دووبارە تۆ ڕوویان لێوەرگێڕە تا کاتێکی دیاریی کراو ﴿١٧٩ وابصر فسوف يبصرون﴾ ببینە، لەمەولا ئەوانیش ئەبینن بەرهەمی نکوڵی و بێ بڕوایی خۆیان وەپێش دێت ﴿١٨٠ سبحان ربك رب العزة عما يصفون﴾ بەرزیی وبڵندیی، پاك وخاوێنی بۆ پەروەرد گاری تۆ، پەروەردگاری خاوەن دەسەڵات، لەو قسانە ئەوان پەسن و وەسفی ئەوی پێئەکەن ﴿١٨١ وسلام على المرسلين﴾ و سڵاوو درودیش بۆ سەر گشت پەیامبەران ﴿١٨٢ والحمد لله رب العالمين﴾ وسوپاس وستایشیی نەبڕاوەو هەتا هەتاییش هەر بۆخودایە کە پەروەردگارو ڕاهێنەری جیهانەکانە، چونکە ئەوە خاوەنی گشت نازو نیعمەتە کان.

تێبینی: هەرکات مرۆڤێك ویستی لە جێگایەك هەڵسێ و بچێت، سووننەتە ئەم زیکرە بخوێنێ: ((سبحان ربك رب العزة عما يصفون وسلام على المرسلين والحمد لله رب العالمين)).

زۆر سوپاسی شایستە بۆ پەروەرندەو ڕاهێنەری هەموو دنیا، وا یارمەتی دام بۆ تەواوکردنی تەفسیری سوورەتی (صافات).

*** *** ***

## ٣٨- سوورەی ( صاد )ـە

## مەککەییەو ( ٨٨ ) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتە لە دوای سورەتی (قەمەر)ـەوە هاتۆتە خوارەوە، دیارە ئەمیش وەك هاوچەشنەکانی خۆی, باسی ئەم چەند شتە گرنگەیە دەکات, وەکو: یەکتاپەرستیی، وەحیی وسروش بۆ پەیامبەر ﷺ پاداشت و تۆڵە، زیندوو بوونەوە ئەکات. جا لە سەرەتاوە بەسوێندێك بەقورئان دەست پێدەکات، پاشان یەکتاپەرستیی و، نکووڵی موشریکەکان و، سەرسامبوونیان لە بانگە وازەکەی موحەممەد ﷺ، ئینجا چوواندنی قورەیش بە گەلانی کەللە ڕەقی پێش خۆیان وهاتنی سزا بۆیان.. دواتریش هەندێ لە داستانی پەیامبەران (عليهم الصلاة والسلام) بۆ دڵخۆشیدانەوەی پەیامبەر ﷺ. کۆتاییشی دێت بەباسکردنی ئەرکی زۆرگرنگی پەیامبەر ﷺ کە لەگەڵ هەموو پەیامبەرانیش وەك یەك وایە. جا بەم شێوەیەش دەست پێ ئەکات: ﴿بسم الله الرحمن الرحيم* ١ ص﴾ پیتی (صاد) یش هەر وەك پیتی سوورەتەکانی ترهێمای ئیعجازی قورئانن و,ڕەمزی بە گژاچوونی قورەیشن لەبەرامبەر

قورئانەوە ﴿[٢] والقران ذی الذکر﴾ سوێند بەم قورئانە خاوەن شەرەفە, کە بۆکەسێ کاری پێ بکا, مایەی ناوو شۆرەتێکی چاك بەرزو پیرۆزە، واتە: ئەم قورئانە خۆی لەخویدا مۆعجیزەیەو، موحەممەدیش ﷺ راست ئەکات ﴿[٣] بل الذین کفروا فی عزة وشقاق﴾ نەخێر، کە ئەوان بڕوا ناهێنن بە قورئان، لەبەر ئەوە نیە قورئان هەق نەبێ, لەبەرئەوە نییە کە ناتەواوییەکیان تیادیتبێ، بەڵکو بۆ خۆیان کافروخوانەناس ودەمار بەرز و ئاشوبسازن ,بۆیە بڕواناهێنن ﴿کم اهلکنا من قبلهم من قرن﴾ پێش ئەوانیش خەڵکێکی زۆرمان لە ناوبرد، چونکە هەرئەو وڕێنەی ئەمانەیان دەکرد ﴿فنادوا ولات حین مناص﴾ جا لە کاتی هاتنی سزاکەدا, هەر هاوارهاوارو لاڵەیان بوو و داوای کۆمەکیان ئەکرد، بەڵام کات کاتی رزگارکربوون نەبوو، ئایەتی: (فلما أحسوا بأسنا إذاهم منها یرکضون) ١٢/٢١ دووپاتی ئەو ماناو مەبەستە دەکات.

الجزء الثالث والعشرون — سورة ص

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

صٓ وَٱلْقُرْءَانِ ذِى ٱلذِّكْرِ ﴿١﴾ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى عِزَّةٍ وَشِقَاقٍ ﴿٢﴾
كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّن قَرْنٍ فَنَادَوا۟ وَّلَاتَ حِينَ مَنَاصٍ ﴿٣﴾ وَعَجِبُوٓا۟
أَن جَآءَهُم مُّنذِرٌ مِّنْهُمْ ۖ وَقَالَ ٱلْكَٰفِرُونَ هَٰذَا سَٰحِرٌ كَذَّابٌ ﴿٤﴾
أَجَعَلَ ٱلْءَالِهَةَ إِلَٰهًا وَٰحِدًا ۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَىْءٌ عُجَابٌ ﴿٥﴾ وَٱنطَلَقَ ٱلْمَلَأُ
مِنْهُمْ أَنِ ٱمْشُوا۟ وَٱصْبِرُوا۟ عَلَىٰٓ ءَالِهَتِكُمْ ۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَىْءٌ يُرَادُ ﴿٦﴾
مَا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِى ٱلْمِلَّةِ ٱلْءَاخِرَةِ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا ٱخْتِلَٰقٌ ﴿٧﴾ أَءُنزِلَ
عَلَيْهِ ٱلذِّكْرُ مِنۢ بَيْنِنَا ۚ بَلْ هُمْ فِى شَكٍّ مِّن ذِكْرِى ۖ بَل لَّمَّا يَذُوقُوا۟ عَذَابِ
﴿٨﴾ أَمْ عِندَهُمْ خَزَآئِنُ رَحْمَةِ رَبِّكَ ٱلْعَزِيزِ ٱلْوَهَّابِ ﴿٩﴾ أَمْ لَهُم
مُّلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ۖ فَلْيَرْتَقُوا۟ فِى ٱلْأَسْبَٰبِ ﴿١٠﴾
جُندٌ مَّا هُنَالِكَ مَهْزُومٌ مِّنَ ٱلْأَحْزَابِ ﴿١١﴾ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ
نُوحٍ وَعَادٌ وَفِرْعَوْنُ ذُو ٱلْأَوْتَادِ ﴿١٢﴾ وَثَمُودُ وَقَوْمُ لُوطٍ وَأَصْحَٰبُ
لْـَٔيْكَةِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلْأَحْزَابُ ﴿١٣﴾ إِن كُلٌّ إِلَّا كَذَّبَ ٱلرُّسُلَ
فَحَقَّ عِقَابِ ﴿١٤﴾ وَمَا يَنظُرُ هَٰٓؤُلَآءِ إِلَّا صَيْحَةً وَٰحِدَةً مَّا لَهَا
مِن فَوَاقٍ ﴿١٥﴾ وَقَالُوا۟ رَبَّنَا عَجِّل لَّنَا قِطَّنَا قَبْلَ يَوْمِ ٱلْحِسَابِ ﴿١٦﴾

٤٥٣

## موشریکان لە پێغەمبەرێتی و یەکتاپەرستیی و قورئان سەراسیمەن!:

﴿[٤] وعجبوا ان جاءهم منذر منهم﴾ سەرسامان لەوە کە هەر لەخۆیان – نەك لە فریشتە–پەیامبەرێکی (ترسێنەریان) بۆهات؟!. ئەم ئایەتەی ئێرە, وەك ئەو ئایەتە وایە خوا لەسوورەتێکی تردا ئەفەرموێ: (أکان للناس عجبا أن أوحینا إلی رجل منهم ان انذر الناس)٢/١٠. ﴿وقال الکافرون هذا ساحر کذاب﴾ بێباوەڕەکان –لەباتی تەسلیم بوون و باوەڕهێنان– وتیان: ببێ، نەبێ ئەم موحەممەدە کە دەڵێت:من نێرراوی خوام جادووگەرێکی درۆزنە! ﴿[٥] أجعل الآلهة إلها واحدا﴾ ئەرێ هەموو خواکانی کردۆتە یەك خوا؟! ﴿إن هذا لشئ عجاب﴾ بە راستیی ئەمە کە موحەممەد ﷺ دەیڵێ،(واتە: یەك خواپەرستن) شتێکی سەیرو سەمەرەیە! ﴿[٦] وانطلق الملأ منهم﴾ سەرکردەو ناودارەکانیان کەوتنە ڕێ و کۆڕەکەی (ئەبوتالیب)یان بەجێ هێشت پاش ئەوەی داوای ناو بژیوانیان لێکردبوو ﴿أن امشوا واصبروا علی آلهتکم﴾ جا بە خەڵکەکەیان وت: لەسەر پەرستنی خواکانتان بچن و سەبر بگرن و، دەستیان لێ بەرمەدەن ﴿إن هذا لشئ یراد﴾ بە راستیی ئەمە –کە موحەممەد هێناویەتی و داوای پەرستنی یەك خوا دەکات– شتێکی خوازراوەلە ئێمە, واتە: پیلانێکە دارێژ راوە بۆ دوور خستنەوەکان لە پەرستنی خواکانمان ﴿[٧] ما سمعنا بهذا فی الملة الاخرة﴾ ئەمەی موحەممەد دەیڵێ بۆ پەرستنی یەك خوا ,ئێمە لە ئایینی عیسادا عليه السلام نەمان بیستووە ﴿إن هذا إلا اختلاق﴾ ئەم یەکخواپەرستیە هەردرۆو ساختە و هەڵبەستراوەو! ﴿[٨] أانزل علیه الذکر من بیننا﴾ ئایالە نێوان ئێەدا کە ئەوهەموو دەوڵەمەندو پیاوماقووڵەمان تێدایە قورئان بۆئەو هاتووە؟! ﴿بل هم فی شك من ذکری﴾ نەخێر، نکوڵیکردنی قورئان لەرووی زانستەوە نیە، بەڵکو لە بنەرەتا لە شکدان لە قورئانی من ﴿بل لما یذوقوا عذاب﴾، نا, بەڵکو جارێ سزای منیان نەچێژتووە.چونکە ئەگەر چێشتبایان, باوەڕیان دەکرد. (ئیبن عەباس) دەڵێ: کاتێ

کە(ئەبوتالیب) نەخۆشکەوت، دەستەیەك لەناودارانی قورەیش –بە هاوڕێیەتی (ئەبوجەهل) – چوون بۆلای و پێیان وت: تۆ دەزانی برازاکەت چی دەکاو، چی دەڵێ بەخواکانمان؟! بەڵکو بنێری ئامۆژگاری بکەیت! ئەویش ناردی وهات و چووە ژوورەوە و، دیتی لەتەنیشت ئەبووتالیبی مامیەوە جێی تەنها کەسێ ماوە جا (ئەبو جەهل) لەترسی ئەوە نەوەك موحەممەد ﷺ لەوێ دانیشێ و، بەقسە شیرینەکانی ئەبوتاڵیب نەرم بکا، پەلاماری داو چووە پاڵی ئەبووتاڵیب، ئیتر جێ بۆ پێغەمبەر نەمایەوەو لەلای دەرگاکەوە دانیشت! ئەمیش وتی برازاکەم! بۆ چ خزمان گلەییت لێدەکەن سەبارەت بە خواکانیان؟! فەرمووی: مامە! من تەنها یەك قسەم هەیە، ئەگەربیڵێن وبەگوێم بکەن ئەوا هەمووعەرەب گوێرایەڵ دەبن و، ئەگەر عەجەمەکانیش نەیڵێن سەرانەی خۆیان دەدەن. جا هەموویان لەقسەکەی داچڵەکین و وتیان: ئێمە لەباتی ئەو، ئەو وشەیە دەڵێین. ئەبووتاڵیب وتی: برازاکەم! وشەکەی تۆ چییە؟ فەرمووی: (لا إله إلا الله)یە. پاش ئەوە هەموو تووڕە بوون و هەڵسان و ڕۆیشتن و خۆیان ئەتەکان و بەدەم ڕێگەوە دەیانگوت: (أجعل الآلهة إلها واحدا!). (ئیبن جەریر، ئەحمەد، نەسائیی، ترمزیی) ڕیوایەتیان کردووە). ﴿[٩] أم عندهم خزائن رحمة ربك العزيز الوهاب﴾ ئەوانە وا نکوڵیی پەیامبەرێتی تۆ ئەکەن، مەگەر گەنجینەی فەزڵ و میهرەبانی پەروەردگاری بەتواناو خاوەن بەخشندەی تۆیان لایە؟ ,تا بەئارەزووی خۆیان کێیان پێ چاکبێ بیکەنە پەیامبەر؟ ﴿[١٠] أم لهم ملك السموات والأرض وما بينهما﴾ یاخۆ خاوەنداریێتی ئاسمانەکان و زەویی و ئەوەی نێوانیان هیئەوانە، تا بەئارەزووی خۆیان کێ دەکەنە پێغەمبەر؟! ﴿فليرتقوا في الأسباب﴾ جا ئەگەر هی ئەوانە دەبا بەئاسمانەکاندا پەیژەدانێن و سەرکەون و بەرز بنەوەو لەوێ ڕاوێژی بونەوەر بکەن و کێیان پێشیاو بوو بیکەنە پەیامبەرو، نەهێڵن وەحیت بۆ بێت ﴿[١١] جند ما هنالك مهزوم من الأحزاب﴾ دیارە ئەوانە ئەم قسانە دەکەن, کاتی خۆی لە(بەدر) سوپایەکی شپرزەو ریسواو تێکشاون، پێکهاتوون لەچەند دەستەوپارتێك. واتە: ئەمانە لەئەنجامدا هەر ڕۆژێکی ڕەشیان بۆ ئەبێ، ئەوەبوو لە (بەدر)و لەچەندجێگایەکیتردا تێکشکان.

## لە قڕکردنی گەلانی پێشوو پەند وەرگرن:

﴿[١٢] كذبت قبلهم قوم نوح وعاد وفرعون ذو الأوتاد﴾ پێش قورەیشیش گەلی (نووح)و، عادی گەلی (صالح) و، فیعەونی لەشکردار ﴿[١٣] وثمود وقوم لوط وأصحاب الأيكة﴾ هۆزی (سەموود)وهۆزی(لووط)و خەڵکی ناوباخچە چڕوپڕەکان – واتە:گەلی شوعەیب– پەیامبەرەکانیان بەزماندرۆزن زانیو بڕوایان نەهێنا ﴿أولئك الأحزاب﴾ ئا ئەوانەیش پارتەکان, واتە: ئەوانەی کۆبوونەوە بۆ لەناو بردنی پەیامبەرەکانیان ﴿[١٤] إن كل إلا كذب الرسل فحق عقاب﴾ گش ئەوانە پەیامبەرەکانیان بەدرۆزن دانا! ئینجا سزای منیان بۆ پێویست بوو ﴿[١٥] وما ينظر هؤلاء إلا صيحة واحدة﴾ ئەم بێباوەڕانی مەککەیەش, هەر چاوەنۆڕی نەعرەتەو دەنگێکی گەورە(واتە: نەفخەی زیندوو کردنەوە) دەکەن و, ئیتربە ڕۆژەکەی خۆیان دەگەن ﴿ما لها من فواق﴾ هەرکە هاتیش دووبارە بونەوە نیە، واتە بە ئەندازەی ماوەی دووجار دۆشینی وشترێکیش، مۆڵەت نادرێن, بەڵکو زوو لەناودەبرێن ﴿[١٦] وقالوا ربنا عجل لنا قطنا قبل يوم الحساب﴾ بەگاڵتەیشەوە وتیان: ئەی پەروەردگاری ئێمە! پێش ڕۆژی حیساب و پاداشت و تۆڵە،بەشە سزاکەمان بە پەلە بۆ بێنە! واتە: ئەگەر موحەممەد ﷺ ڕاست دەکا زیندوو بوونەوە هەیە، دەبا هەر ئەمڕۆ سزامان بدا، وەك ئەیانگوت: (اللهم إن كان هذا هو الحق فأمطرنا علينا..)٣٢/٨.

**باسێکی داوود عليه السلام:**

﴿[١٧] اصبر علی مایقولون﴾ خۆ ڕاگربە ئەی موحەممەد! لەبەرامبەر ئەوەوە ئەوان دەیڵێن، چوون تۆ خوات لەگەڵە.. دیارە ئەمە دڵخۆشکردن و دڵدانەوەی پەیامبەرە ﷺ بەرامبەر ئەو هەموو ئازارو بێزارەی قورەیشە ﴿واذکر عبدنا داود ذا الأید﴾ دەسا فەرموو (داوود) پێغەمبەر(علیه السلام) وەبیر بێنە، کە لەئاییندارییی و لە خواپەرستیی و دەسەڵاتدا عەبدێکی خاوەن هێزی ئێمە بوو ﴿إنه أواب﴾ بێگومان لەهەموو کارێکدا هەمیشە ئەو, گەڕاوەو تەوبەکاربوو بۆ لای خوا، هەردەم گوناحێ، دەغدەغەیە بەدڵیا هاتبا بەپەلە پەشیمان دەبوویەوە و دەگەڕایەوە لای خوا،دیارە هەموو پێغەمبەران پیشەیان هەر ئەوە بووە، وەکو پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: ((..إنی لأستغفرُ اللهَ فی الیوم واللیلة مأةَ مرة..)) موسلیم/ بابی (١٢)، ژمارەی فەرموودە:(٢٧٠٢). واتە: بێگومان لەماوەی شەوو ڕۆژێکا من سەدجار (أستغفرالله)و داوای لێبوردن لە خوادەکەم.

الجزء الثالث والعشرون — سورة ص

اصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَاذْكُرْ عَبْدَنَا دَاوُودَ ذَا الْأَيْدِ ۖ إِنَّهُ أَوَّابٌ ﴿١٧﴾ إِنَّا سَخَّرْنَا الْجِبَالَ مَعَهُ يُسَبِّحْنَ بِالْعَشِيِّ وَالْإِشْرَاقِ ﴿١٨﴾ وَالطَّيْرَ مَحْشُورَةً ۖ كُلٌّ لَهُ أَوَّابٌ ﴿١٩﴾ وَشَدَدْنَا مُلْكَهُ وَآتَيْنَاهُ الْحِكْمَةَ وَفَصْلَ الْخِطَابِ ﴿٢٠﴾ ۞ وَهَلْ أَتَاكَ نَبَأُ الْخَصْمِ إِذْ تَسَوَّرُوا الْمِحْرَابَ ﴿٢١﴾ إِذْ دَخَلُوا عَلَىٰ دَاوُودَ فَفَزِعَ مِنْهُمْ ۖ قَالُوا لَا تَخَفْ ۖ خَصْمَانِ بَغَىٰ بَعْضُنَا عَلَىٰ بَعْضٍ فَاحْكُمْ بَيْنَنَا بِالْحَقِّ وَلَا تُشْطِطْ وَاهْدِنَا إِلَىٰ سَوَاءِ الصِّرَاطِ ﴿٢٢﴾ إِنَّ هَٰذَا أَخِي لَهُ تِسْعٌ وَتِسْعُونَ نَعْجَةً وَلِيَ نَعْجَةٌ وَاحِدَةٌ فَقَالَ أَكْفِلْنِيهَا وَعَزَّنِي فِي الْخِطَابِ ﴿٢٣﴾ قَالَ لَقَدْ ظَلَمَكَ بِسُؤَالِ نَعْجَتِكَ إِلَىٰ نِعَاجِهِ ۖ وَإِنَّ كَثِيرًا مِنَ الْخُلَطَاءِ لَيَبْغِي بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَقَلِيلٌ مَا هُمْ ۗ وَظَنَّ دَاوُودُ أَنَّمَا فَتَنَّاهُ فَاسْتَغْفَرَ رَبَّهُ وَخَرَّ رَاكِعًا وَأَنَابَ ۩ ﴿٢٤﴾ فَغَفَرْنَا لَهُ ذَٰلِكَ ۖ وَإِنَّ لَهُ عِنْدَنَا لَزُلْفَىٰ وَحُسْنَ مَآبٍ ﴿٢٥﴾ يَا دَاوُودُ إِنَّا جَعَلْنَاكَ خَلِيفَةً فِي الْأَرْضِ فَاحْكُمْ بَيْنَ النَّاسِ بِالْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ الْهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ ۚ إِنَّ الَّذِينَ يَضِلُّونَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ بِمَا نَسُوا يَوْمَ الْحِسَابِ ﴿٢٦﴾

وما خلقنا السماء ٤٥٤

﴿[١٨] إنا سخرنا الجبال معه یسبحن بالعشی والإشراق﴾ بەڕاستیی ئێمە کێوەکانیشمان ڕامکردبوو کە لە گەڵی هەموو ئێواران و بەیانیان تەسبیحاتیان دەکرد ﴿[١٩] والطیر محشورة﴾ هەروا مەل و پەلەوەرەکانیش کۆمەڵ دەبوون و بەفەرمانی خوا لەگەڵ داود دا تەسبیحاتیان ئەکرد ﴿کل له أواب﴾ هەمووشیان (کێوان و پەلەوەرەکان) ملکەچی فەرمانی ئەو دەبوون و هەردەم بەرەو ئەو دەهاتن، لەوە ئەچێ هەندێ کەس لەم هەواڵ و باسەدا سەراسیمە مابێ!، بەڵام ئەوانەی کەخۆیان یەکلا کردۆتەوە بۆ خوا چاکدەزانن و، تێ ئەگەن کە بوونەوەر هەموو بەرفەرمانی خوایەو، هەموویشی مانای بوونی خواو تاک وتەنیایی ئەو دەگەیەنێ ﴿[٢٠] وشددنا ملکه﴾ و دەسەڵات و پاشایەتیەکەیمان بۆ توندو تۆڵکرد، بە زۆری سوپاو سەرکەوتن وسام و هەیبەت ﴿وآتیناه الحکمة وفصل الخطاب﴾ پەیامبەرێتی و فەهم و، وردەکاریی و، کارزانیی و، خیتابی کێشە بڕەوەمان پێدا, تا کێشەی خەڵکی پێ ببڕێتەوەو پێیچارەی بکات.

**دوو دادچی دەچنە لای داوود عليه السلام:**

﴿[٢١] وهل أتاك نبأ الخصم إذ تسوروا المحراب﴾ ئایا تۆ ئەی موحەممەد! هەواڵی داواچیەکانت پێگەیشتووە, کاتێ کە بەدیواری عیبادەتخانەکەی (داود)دا بێئیزن و مۆڵەت سەرکەوتن ,بۆ بڕانەوەی کێشەیەك هەیان بوو؟. ﴿[٢٢] إذ دخلوا علی داود ففزع منهم﴾ کاتێ کە بێ مۆڵەت وەرگرتن چوونە ژوورەوە لای (داوود), لەبینینیان شڵەژاو ترسا ﴿قالوا لا تخف خصمان بغی بعضنا علی بعض﴾ وتیان: مەترسە! ئێمە دوو داواچین دژ بەیەکترو، داوامان لە سەر یەکتر هەیە، هەندێکمان ستەمی لەو هەندەکەی تر کردووە ﴿فاحکم بیننا بالحق ولا تشطط﴾ جا هاتووین لە نێوانماندا بەدادگەرانە داوەریی بکەو ستەم لەهیچ لامان مەکە ﴿واهدنا إلی سواء الصراط﴾ و بۆ ڕاستەڕێ

ڕێنموونیمان بکە، واتە: بەڕێکی دادگەریمان بکە ﴿[٢٣] إن هذا أخي له تسع وتسعون نعجة﴾ کێشەکەیشمان ئەمەیە: کە ئەم برامە (٩٩) سەر مەڕی هەیە ﴿ولي نعجة واحدة﴾ و منیش تەنها یەك مەڕم هەیە ﴿فقال اكفلنيها﴾ کەچی هێمان ئەڵێ: دەبێ ئەو تەنها مەڕەشم پێبدەی! ﴿وعزني في الخطاب﴾ وە لەقسەشدا بەسەرما زاڵەو دەرەقەتی نایەم، جا لێرەدا لەبەر گەورەیی ستەمەکە، (داود)پێغەمبەر پەلەیکردو لەکێشەی (مدعی علیه)ی نەپرسی، بزانێ چیە، ئەوجا بڕیار بدات ﴿[٢٤] قال لقد ظلمك بسؤال نعجتك إلى نعاجه﴾ بۆیە بەخێرایی بەخاوەن سکاڵاکەی وت: بە ڕاستیی بەداوا کردنی مەڕەکەت ، بۆ پاڵ مەڕەکانی خۆی، ستەمی لێکردوویت ﴿وإن كثيرا من الخلطاء ليبغي بعضهم على بعض﴾ هەروایشبووە بەراستی زۆرێ لە شەریکە ماڵەکان فێڵ وستەم لەیەکتر ئەکەن ﴿إلا الذين آمنوا وعملوا الصالحات﴾ ئەوانە نەبێت کە باوەڕیان هێناوەوکردەوە چاکەکانیان کردووە ﴿وقليل ماهم﴾ دیارەئەوانەیش زۆرکەمن. لەوە ئەچێ -خوا خۆیشیچاکتر ئەزانێ - ئەو دوو داوا چیە فریشتە بووبن ,چونکە هەر پاشی باسکردنی کێشەکەیان, لەپێش چاو (داوود)دا ونبوون و نەمان, فریشتە بوون، خوا ناردنی بۆ تاقیکردنەوەی شێوەی حوکم و دادگایی (داود). ﴿وظن داود انما فتناه﴾ ئیتر داود زانی کەئێمە بەو کێشەیە تاقیمان کردۆتەوە ﴿فاستغفر ربه وخر راكعا وأناب﴾ ئنجا - سەبارەت بەوهەڵەیەی کردی - بەپەلە داوای لێبوردنی لە پەروەردگاری خۆی کردو بەسوژدەدا کەوت وگەڕایەوە بۆلای خوا بە تەوبە، پێشەوا شافیعی دەڵێت: (سوژدەی سوورەتی (ص)، سوژدەی شوکرانە بژێری خوایە، (ئیبن عەباس) دەڵێت: (ليست من عزائم السجود، وقد رأيت رسول الله ﷺ يسجد فيها) مسند أحمد، فتح الباري"٨/٤٠٥، سنن أبي داود، عارضة الأحوذي، النسائي). ﴿[٢٥] فغفرنا له ذلك﴾ ئینجا ئێمەیش زووبۆمان پۆشی.بەداخەوە لەم جێیەدا هەندێ تەفسیر بڕێ شت دەنووسن، کەس ڕووی نیە بۆپیاوێکی بەشەرەفی دنیایشی بنووسێ، ئیتر نازانم چۆن دەتوانن بۆپەیامبەرێکی وەك داوودی بنووسن! ئەگەرچی زۆرێکیان بەتوندی ڕەتیئەدەنەوە، وەك (رازیی، بەیزاویی، ئالووسیی، ئیبن کەسیر، قاسمیی، حیجازیی، مەراغیی، شەنقیتیی، سەید قوتب و..هتد) لەولاشەوە خوا خۆی ئەفەرموێ: ﴿وإن له عندنا لزلفى وحسن مآب﴾ بێگومان ئەولای ئێمە نزیکییەك و خۆش جێگەیەکی بۆ هەیە لە بەهەشتدا, وەکو لە جێگایەکی تردا دەفەرموێ: (وإن للمتقين لحسن مآب جنات عدن مفتحة لهم الأبواب)٣٨/٤٩-٥٠. ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکیتریشەوە تاقیب و بەدواداهێنانی جۆری تاقیکردنەوەکە, باری ڕاستی ڕووداوەکە ڕوون ئەکاتەوە. ڕاسپاردەیەك بۆ دادوەرو حوکمڕانەکان: ﴿[٢٦] يا داود إنا جعلناك خليفة في الأرض﴾ ئەی داود! بەڕاستیی ئێمە تۆمان کردە جێنشین لەسەر زەوییدا بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری مەردم ﴿فاحكم بين الناس بالحق﴾ دەسا تۆیش بەشێوەیەکی پەسەندو بەهەق ودادگەرانە لەنێوان خەڵکدا بڕیاربدەو حوکم بکە، واتە: وەك بفەرموێ: پەلەمەکەو لەهەردوو لایەنی کێشەکە پرسیاربکە، وەك ئەو کێشەیە مەکە،کە ەلەت تێدا کرد، چونکە پێش ئەوە کەلە (مدعی علیه) پرسیار بکەیت، بڕیای خۆتت دا! ﴿ولا تتبع الهوى﴾ وشوێن هەواوئارەزوو مەکەوە لە حوکمکردندا ﴿فيضلك عن سبيل الله﴾ تا بەو هۆیەوە لەڕێگای خوا گومڕات بکات ﴿إن الذين يضلون عن سبيل الله﴾ بێگومان ئەو کەسانەی کەلە ڕێی خوا لادەدەن و گومڕا ئەبن ﴿لهم عذاب شديد﴾ سزاو جەزرەبەی توندو سەختیان بۆ هەیە ﴿بما نسوا يوم الحساب﴾ بەهۆی ئەوەی کەڕۆژی حیساب وپاداشت وتۆڵەیان لەبیرکردووە.

**بەدیهێنانی ئەم دنیایە بۆ..؟**

﴿[٢٧] وما خلقنا السماء والأرض وما بینهما باطلا﴾ ئاسمان وزەویی و، ئەوەش لەنێوانیاندایە،بە باتڵ و
وبێهوودە دروستمان نەکردووە ﴿ذلك ظن الذین كفروا﴾ ئەوە کە بەبێ هوودە دروستمانکردبن، گومان و بۆچوونی
بێ بڕواو خوانەناسانە ﴿فویل للذین كفروا من النار﴾ سزاو تیاچوون بۆ بێ بڕوایان لەناوئاگری دۆزەخدا. ئینجا
خوا باسدەکا کە: حیکمەت و عەدل لەوەدایە, نابێ موسڵمان و کافر وەکو یەك بن، بۆیە دەفەرموێ: ﴿[٢٨] أم نجعل
الذین آمنوا وعملوا الصالحات كالمفسدین فی الأرض﴾ ئایا دەکرێت ئەوانەیکە باوەڕیان هێناوەو کارەچاکەکانیان
کردووە، وەکو بەدکاران و ئاژاوەگێران لە زەویدا دابنێین و,وەك یەك حسێبیان بۆ بکەین؟ ﴿أم نجعل المتقین
كالفجار﴾ یاخۆدەبێ خەڵکانیپارێزکار, لە گوناح و تاوان،
وەکو خەڵکانی خراپکار دابنێین؟.ئینجا خوا ئامانج لە
ناردنەخوارەوەی ئایەتەکانی قورئان باس دەکاو دەفەرموێ:
﴿[٢٩] كتاب أنزلناه إلیك مبارك﴾ ئەمە کتێبێکە پیرۆز,دامان
بەزاند بۆ تۆ ئەی موحەممەد!ﷺ ﴿لیدبروا آیاته﴾ تا ئەوانە
لەئایەتەکانی رابمێنن ﴿ولیتذكر أولوا الألباب﴾ وفامیدەو
ژیرەکانیش ئامۆژگاری لێوەرگرن. (شێخ حەسەنی
بەصریی) دەڵێت: سوێندم بەخوا لەبەرکردنی گشت
پیتەکانی هەموو قورئان و، پشتگوێ خستنی
مەبەستەکانیشی تەدەبوور وتێفکران نییە، هەندێ کەس
ئەڵێ: ئەمە سوێندی بێت تەواوی قورئانم لەبەرەو تەنها
پیتێکم لێنەپەڕاندووە، بەڵام ئەگەر ماناوداواکارییەکانی
پشتگوێ خستبێ، سوێند بەخوا ئەوکەسە هەموو قورئانی
پەڕاندووە وپشتگوێی خستووە!.

**کورتە باسێکی سولەیمان علیه السلام :**

لەم چەند ئایەتانەشدا داستانەکەی (سولەیمان) دەست
پێدەکاو ئەفەرموێ:﴿[٣٠] ووهبنا لداود سلیمان﴾

الجزء الثالث والعشرون — سورة ص

وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَٰطِلًا ذَٰلِكَ ظَنُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟
فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنَ ٱلنَّارِ ﴿٢٧﴾ أَمْ نَجْعَلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟
ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَٱلْمُفْسِدِينَ فِى ٱلْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ ٱلْمُتَّقِينَ كَٱلْفُجَّارِ
﴿٢٨﴾ كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ مُبَٰرَكٌ لِّيَدَّبَّرُوٓا۟ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُو۟لُوا۟
ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٢٩﴾ وَوَهَبْنَا لِدَاوُۥدَ سُلَيْمَٰنَ نِعْمَ ٱلْعَبْدُ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ
﴿٣٠﴾ إِذْ عُرِضَ عَلَيْهِ بِٱلْعَشِىِّ ٱلصَّٰفِنَٰتُ ٱلْجِيَادُ ﴿٣١﴾ فَقَالَ إِنِّىٓ
أَحْبَبْتُ حُبَّ ٱلْخَيْرِ عَن ذِكْرِ رَبِّى حَتَّىٰ تَوَارَتْ بِٱلْحِجَابِ ﴿٣٢﴾
رُدُّوهَا عَلَىَّ فَطَفِقَ مَسْحًۢا بِٱلسُّوقِ وَٱلْأَعْنَاقِ ﴿٣٣﴾ وَلَقَدْ فَتَنَّا
سُلَيْمَٰنَ وَأَلْقَيْنَا عَلَىٰ كُرْسِيِّهِۦ جَسَدًا ثُمَّ أَنَابَ ﴿٣٤﴾ قَالَ رَبِّ ٱغْفِرْ
لِى وَهَبْ لِى مُلْكًا لَّا يَنۢبَغِى لِأَحَدٍ مِّنۢ بَعْدِىٓ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْوَهَّابُ ﴿٣٥﴾
فَسَخَّرْنَا لَهُ ٱلرِّيحَ تَجْرِى بِأَمْرِهِۦ رُخَآءً حَيْثُ أَصَابَ ﴿٣٦﴾ وَٱلشَّيَٰطِينَ
كُلَّ بَنَّآءٍ وَغَوَّاصٍ ﴿٣٧﴾ وَءَاخَرِينَ مُقَرَّنِينَ فِى ٱلْأَصْفَادِ ﴿٣٨﴾ هَٰذَا
عَطَآؤُنَا فَٱمْنُنْ أَوْ أَمْسِكْ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٣٩﴾ وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلْفَىٰ وَحُسْنَ
مَـَٔابٍ ﴿٤٠﴾ وَٱذْكُرْ عَبْدَنَآ أَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّى مَسَّنِىَ ٱلشَّيْطَٰنُ
بِنُصْبٍ وَعَذَابٍ ﴿٤١﴾ ٱرْكُضْ بِرِجْلِكَ هَٰذَا مُغْتَسَلٌۢ بَارِدٌ وَشَرَابٌ ﴿٤٢﴾
٤٥٥

وەسولەیمانیشمان بەخشی بە داود وکردمانە پەیامبەر ﴿نعم العبد إنه أواب﴾ سولەیمان بەندە باشە بوو، چونکە
هەردەم رووی لەئێمە بوو ﴿[٣١] إذ عرض علیه بالعشی الصافنات الجیاد﴾ بەیاد بکە کە دوا نیوەڕۆیەك ئەسپ
ومایینە چابوك و تیژ ڕەوەکانی -لەسەر نووکی (پێ) وەستابوون و ئامادەکرابوون بۆ جیهاد، نیشانی دران ﴿[٣٢]
فقال إنی أحببت حب الخیر عن ذكر ربی﴾ ئنجا وتی: بەڕاستیی من ئەم ئەسپانەم خۆش دەوێ, چونکە کەرەسەن
بۆ جیهاد, خۆشەویستنەکەشم لە یادکردنی خواوەندەوە پەیدا بووە، سولەیمان چاوی بڕیبوویە ئەوئەسپە رەسەن
وچاپوك و تیژانە کە بە بەردەمیا دەهاتن و دەچون , ئینجا غاردران ﴿حتی توارت بالحجاب﴾ تا لەبەرچاویا
دیارنەمان. جا ئەوهەموو ئەسپ و چارەوێیە بۆسەرکردەیەکی بەغیرەت وموجاهید، گومان نییە کەشتێکی ناوازەیەو
دیاردەیەکی بەرزی سەربازییە، بۆیە سولەیمان یش زۆرخۆشحاڵ بوویێیان وهەرسەیری ئەکردن، پێیخۆشبوو

چاوی لێیان کلا نەبێ، بەڵام کاتێ دوور کەوتنەوەو پەنهانبوون. ﴿[٣٣] ردوها علی﴾ ئەوساوتی: دووبارە بییاگێڕنەوە بۆم ﴿فطفق مسحا بالسوق والأعناق﴾ ئەسپەکانیان بۆگێڕایەوە, ئەویش لەبەر ڕێز لێنانیان وەك (علی کوڕی تەڵحەو ئیبن عەباس) دەڵێنو (تەبەریی) ش پەسەندی کردووە: سولەیمان دەستی هێنا بە لاق وبە گەردنیاندا.

## تاقییکردنەوەکەی سولەیمان عليه السلام:

﴿[٣٤] ولقد فتنا سلیمان﴾ بەڕاستی سولەیمانیشمان تاقیکردەوە, بەنەهێشتنی دەسەڵاتەکەی ﴿والقینا علی کرسیه جسدا﴾ لاشەیەکمان هاویشتە سەرکورسیەکەی ﴿ثم اناب﴾ پاشان پەشیمان بوویەوەو، گەڕایەوە لایئێمە,ئێمەش دەسەڵاتەکەمان بۆ گێڕایەوە.سەبارەت بە دیاریکردنیجۆری تاقیکردنەوەکە گەلێ قسەو قسەڵۆك هەیە، بەڵام هەرئەمەیان بەچاك دەزانم (ئیبن کەسیر) هەڵیبژاردووەو دەڵێ:خوا جۆری ئەوجەستەیەی هاوێژرایە سەر کورسیکەی سولەیمان دیاری نەکردووە, لەبەرئەوە ئێمەش لێیبێ دەنگ دەبین وباوەڕمان هەیە کە خوای کارجوان بە(جەسەد)ێك ,سولەیمانی تاقیکردۆتەوە, دەشڵێ: هەر شتێك لە بارەی دیاریکردنیەوە گوترابێ لە(ئیسرائیلیات)ەو پشتی پێنابەسرێت. خاوەنی (فی ظلال القرآن) سەبارەت بە (الصافنات الجیاد)، وە هەروەها لەمەڕئەو جەسەدەی خرایە سەرکورسییەکەی سولەیمان دەڵێت: دووئاماژە هەیە: بەڵام ئەوەی ڕاستیی بێ,من هیچیانم بەدڵ نییە، چونکە دوورنیە دەست هەڵبەستی جوولەکە بێ، جگە لەوەیش هیچ سەنەدێکی ئەوتۆ نیە پشتیان بگرێ.. وە نایشتوانم قەناعەتیان پێبکەم ودڵنیابم لێیان، لەولایشەوە تەنها یەك فەرموودە هەیە بۆئەو مەبەستە، لەڕاستییدا ئەویش دڵنیانەبووم کە پەیوەندی بەڕووداوەوە هەبێت: (أخرج البخاری فی صحیحە: قال سلیمان لأطوفن اللیلة علی سبعین امرأة کل واحدة تأتی بفارس یجاهد فی سبیل الله، ولم یقل إن شاء الله، فطاف علیهن فلم یحمل إلا امرأة واحدة، جاءت بشق رجل، والذي نفسي بیده لو قال إن شاء الله لجاهدوا في سبیل الله فرسانا أجمعون). جائەوەی ئایەتەکان ئاماژەی بۆئەکەن ئایادەگونجێ هەرئەو لەتە منالە بێت، دیارە ئەویش هەرئەگەرێکە. مەسەلەی ئەسپەکانیش ریوایەتێك دەڵێت: سولەیمان ئەسپێکی زۆری ڕاگرتبوو بەمەبەستی جیهاد، جا سەرلەنێوارەیەکیان سەریلێدان و، بەوهۆیەوە سەرگەرم بوو ونوێژێکی خۆی هەبوو کەلەپێش خۆرئاواوە ئەیکرد لەکیسی چوو.. ئەویش لەباتیئەوە ئەسپەکانی هەموو سەربڕین، بەڵام ئەوەی ڕاستیی بێت هیچیان ناچنە نێودڵەوە، کەوابوو تەنها ئەوەندە ئەتوانین بڵێین: خوای گەورە ئەو دووپەیامبەرەی وەك پەیامبەرانی تر تاقیکردەوە، بەڵام حەقیقەتی چۆنیەتییەکەی نازانین. (موحەممەد بن جەمیل زینۆ) ئەڵێت: من پێم وایە کەسولەیمان جیهادی زۆرلامەبەست بووە، هەربۆیە ئەسپێکی زۆری ڕاگرتبوو، گەڵێ کاتیش خۆی پێوەیان سەرگەرم ئەکردو وەك مانۆڕی سەربازی لەگۆڕەپاندا ئەیهێنان وئەیبردن... هەر تۆزوعەرەقێکی بەسەرو مل وگەردنیانەوە دیتبا لای ئەبردو ئەیتەکان، هەروەك چۆن ولاخ قاشاو ئەدرێ، موحەممەدجەمیل دەڵێ: من ئەمەم بەلاوە پەسەندە نەك ئەوە کەگوایا هەموویانیسەری بڕیبن وگۆشتەکەیانی بەسەرهەژاراندا دابەشکردبێ. ئەوەی ڕاستیی بێت (بەندە)ش هەرئەمە بەدڵە، هەربۆیە لەسەرئەم ڕایە تەفسیری ئایەتەکانم کرد. چوون (عەلیی کوڕی ئەبی طلحە، ئیبن عەباس)یش هەربەم شێوەیە دەڵێن، ئیمامی (ئیبن کەسیر) دەڵێ:(وهذا القول أختاره ابن جریر) ئیبن جەریری تەبەریش هەر ئەم قسەیەی پەسەند کردووە. ﴿[٣٥] قال رب اغفر لی وهب لی ملکا لا ینبغی لأحد من بعدی﴾ سولەیمان زۆر زوو پەشیمان بوویەوەو وتی: پەروەردگاری من! بمبەخشەو حوکم ودەسەڵاتێکی وایشم پێببەخشە کە لەدوای من گیری هیچ کەسێك نەکەوێت ,تا ببێتە موعجیزەو نیشانەی پەیامبەرێتیم, وەك ئەوە کە هەرپەیامبەرەی ,موجیزەی خۆی

هەبووە ﴿إنك انت الوهاب﴾ بێگومان هەر ئەتۆی بەخشندە ﴿[٣٦] فسخرنا له الرياح﴾ ئینجا ئێمەیش نزاکەیمان لێوەرگرت و ، (با)مان بۆ کەویی و رامکرد ﴿تجري بأمره رخاء حيث اصاب﴾ بەنەرمیی و لەسەر خۆ بۆ هەر جێگایەك ویستبای بەفەرمانی ئەو دەکەوتە ڕێ و دەڕۆیی ﴿[٣٧] والشياطين كل بناء وغواص﴾ و هەموو وەستا بەنایەك و ژێردەریایەك لە شەیاتینمان بۆکەوی و رامکرد, تا هەندێکیان لەوشکانیدا بیناسازیی بۆ بکەن و، هەندێکیشیان سەرقاڵی بنی دەریاکان بن ﴿[٣٨] وآخرين مقرنين فی الأصفاد﴾ و هێندێکیتریشیان پێکەوە کۆت و زنجیرکرا بوون، چونکە زیانبەخش بوون و گوێرایەڵ نەبوون! بەڵێ رام و کەویی کردنی جنۆکە بۆ ئیش وکاروو، تەوق و زنجیر کردنی هەندێکیشیان، بۆخوای گەورە کارێکی زۆر سادەو ئاساییە، بۆیە بڕوامان وایە کە خوا ئەوئیشەی بۆ (سولەیمان) کردووە لەوەڵامی (رب هب لی ملكا لا ينبغی لأحد من بعدی..)دا. ﴿[٣٩] هذا عطاؤنا فامنن أو امسك بغير حساب﴾ وەحیمان بۆی کرد: ئەمە بەخششی بێ ژمارەی ئێمەیە، دەساتۆش(ئەی سولەیمان!) ببەخشە، یا ڕای بگرە، هیچ جۆرە لێکۆڵینەوەیەکت لەسەر نییە ﴿[٤٠] وإن له عندنا لزلفى وحسن مآب﴾ بەڕاستی لای ئێمە نزیکیەك و خۆش جێگایەکی بۆ هەیە. سەرنجێك: (قورتوبی) گەلێ شتی سەیرو سەمەرەی لەبارەی ئەم (فیتنە)ی (سولەیمان)نەوە لە (سەعلەبی)یەوە هێناوە، هەرچەند خۆی هەندێکی رەت ئەکاتەوە، بەڵام زۆرێکیشی بێ (تەعلیق) جێ دێڵێ! (شێخ عرفان العشا) لێکۆڵەرەوەو دەرهێنەری فەرموودەکانی تەفسیری قورتوبی دەڵێ: (والثعلبی هذا كذاب متروك يروى الموضوعات والإسرائيليات. وكذا كتابه المسمى با(العرائس). وە هەروەها لەبەرگی (٨ل٤چ١٩٩٥) دەڵێ: (وأما الحكيم الترمذی – رحمه الله – فقد ساق فی كتابه (نوادر الأصول) أحاديث موضوعة ولا أصل لها كثيرا ما اعتمد على روايته المصنف اى القرطبی رحمه الله فتنبه لذلك.

**سەربوردەکەی ئەیوب ﵇:**

﴿[٤١] واذكر عبدنا ايوب﴾ باسی بەندەکەمان (ئەیوب)ی کوڕی (ئیسحاق) سەلامی خوایان لەسەر بێت بکە ﴿إذ نادى ربه أنى مسنى الشيطان بنصب وعذاب﴾ کاتێ کە هاواری بۆ پەروەردگاری خۆی بردو وتی: بێگومان شەیتان منی دووچاری نارەحەتیی و لەش بەباری کردوم. قورئان جۆری بەڵاو نارەحەتییەکەی دیاریی نەکردووە.. وە لەو بارەوە گەلێ شتیش وتراوە! بەڵام مەگەر تەنها خوای کارزان بارە راستەکەی بزانێت ﴿[٤٢] اركض برجلك﴾ پێمان وت: دەپێی خۆت بکوتە بەزەویدا ﴿هذا مغتسل باردو شراب﴾ ئەمە ئاوێکی خۆشگەواری فێنك وبەکەڵکە, بۆ خۆشۆرین و خواردنەوە, واتە: لێی بخۆرەوەو خۆیشت تێیدا بشۆ ,پاشان ئەویش خۆی تیا شۆری و، لێیخواردەوە، ئەوجا خوای دلۆڤان شیفای داو نارەحەتییەکەی لەسەرهەڵگرت ﴿[٤٣] ووهبنا له أهله ومثلهم معهم رحمة منا﴾ ئینجا ئێمەش (ژن و منداڵەکانی) خۆیی و، ئەوەندەی تریشمان پێ بەخشیی،ئەمەیش هەر لە بەر بەزەییەك بوو لە ئێمەوە بۆ ئەو, واتە: زیاتر لەجارانمان پێ بەخشیەوە ﴿وذكرى لأولى الألباب﴾ وە لەبەر ئامۆژگارییەك بوو, بۆ خاوەنانی ژیریی,بۆ ئەوەی کە ئەنجامی خۆراگرتن و دەروو لێکردنەوە بزانن ﴿[٤٤] وخذ بيدك صغثا فاضرب به ولا تحنث﴾ وە وەحیمان بۆکرد: قۆڵێ تووڵ وردو زراو، یان هەر شتێکی تەڕو ناسك وەك ڕێحان، بگرە دەستت ولە هاوسەرەکەت بدە وسوێندەکەت مەشکێنە. خوا لەقورئاندا روونی نەکردووەتەوە کە ئاخۆ بۆچی، وە لەسەرچی سوێندی لێخوارد. بەڵام هەندێ ریوایەت ئەڵێ: (ئەیوب) نەخۆش کەوت و زۆریش بێ تاقەت بوو، ئەوسا ژنەکەی بۆ کارێکی خێزانی خۆیان ناردو درەنگ هاتەوە، ئەویش لەبێزاری گیانی خۆیدا سوێندی لێخوارد کە: هەرکات چاك بوویەوە دەبێ سەد داری لێبدات.. ئەوجا خوای گەورەیش ئەو مۆڵەتەی بۆ داو فەرمووی: چەپکێ ناسکی صەد لاقی بگرە

بەدەستەوە.. (ئیبن کەسیر)یش هەر شتێکیئاوا هەڵئەبژێرێ، بەلام وریابە! گەلێ لەتەفسیرەکان لە (سەعلەبی)یەوە سەیرو سەمەرەی زۆر دێنن کە بۆ پێغەمبەران دەست نادەن! باس بکرێن ﴿إنا وجدناه صابرا نعم العبد﴾ بەڕاستیی ئێمە ئەومان بەپیاوێکی خۆڕاگرو بەحەوسەڵە دەست کەوت، ئای چ بەندەیەکی چاك بوو ئەیوب ﴿إنه أواب﴾ بەراستیش هەمیشە تەوبەکارو ڕوو لەخوا بوو.

**ئەم پێغەمبەرانەشتان لەبیر بێ:**

﴿[٤٥] واذكر عبادنا إبراهيم وإسحاق ويعقوب﴾ بەندەکانمان: (ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقووب) بەیاد بکە ﴿أولي الأيدي والأبصار﴾ خاوەنانی هێزلە ئایین ودنیا,وەخاوەنانی بینایی لەزانست و ئایندا,واتە: کۆمەڵە پیاوێکی خۆڕاگرو بەتواناو جوامێرو ئەهلی دڵ و حەقیقەت بوون ﴿[٤٦] إنا أخلصناهم بخالصة ذكرى الدار﴾ بەڕاستی ئێمە ئەوانمان تایبەتمەندکرد بە سیفەتێك(یادکردنی ماڵی ئاخیرەت) وایان لێهات هەموو کات لەیادی ڕۆژی قیامەتدا بوون ﴿[٤٧] وإنهم عندنا لمن المصطفين الأخيار﴾ وبەراستیئەوان لامان لە هەڵبژێردراوانی چاکان بوون، ببوونە دۆستی تایبەتیبۆمان ﴿[٤٨] واذكر إسماعيل واليسع وذا الكفل﴾ و(ئیسماعیل) و (ئەلیەسع) و (ذوالكفل)یش بەیاد بکە ﴿وكل من الاخيار﴾ هەر هەمووشیان لە پیاو چاکانن ,دەسا ئێوەیش چاویان لێ بکەن و بەئارام بن.



**جێگەی لە خواترسان خۆشە:**

﴿[٤٩] هذا ذكر﴾ ئائەمە گێڕامانەوە بۆت لەهەواڵی ئەو پێغەمبەرانە, شەرەف و ناو بانگێکی جوانە, ئەوانی پێ یاد دکرێنەوە بە ئەبەدی,وەك بیرەوەرییەکی گەورەو پیرۆز ﴿وإن للمتقين لحسن مآب﴾ وە بەڕاستیی پارێزکاران لەو دونیا جێگای جوان و چاکیان بۆ هەیە ﴿[٥٠] جنات عدن مفتحة لهم الأبواب﴾ چەند بەهەشتێکی دەرگا والأو لەسەر پشتە بۆیان ,ئامادەو چاوەڕوانی هاتنیانە ﴿[٥١] متكئين فيها يدعون فيها بفاكهة كثيرة وشراب﴾ ئەمە حاڵیانە کە لەو بەهەشتەدا لەسەر تەخت پاڵیان داوەتەوە، وە هەر جۆرە میوەو خواردنەوەیەك ئارەزوو بکەن لەبەردەستیاندایەو داوا دەکەن، واتە: هەرکات شتێکیان نیاز کرد، خێرا بێزەحمەت کێشان بۆیان ئامادە ئەبێ ﴿[٥٢] وعندهم قاصرات الطرف أتراب﴾ وچەند کیژێکی هاوتەمەنیان لەلایە، کە هەر تەماشای مێردەکانی خۆیان دەکەن ,وە لەخەڵکانی نامۆو نەیارو چاو داخەرن ﴿[٥٣] هذا ما توعدون ليوم الحساب﴾ پێیان دەگوترێ: ئائەمە ئەو نازو نیعمەتانەیە, بۆ ڕۆژی پاداشت و تۆڵە بەڵێنتان پێدەدرێ ﴿[٥٤] إن هذا لرزقنا ما له من نفاد﴾ بەڕاستیی ئەمە رزق و ڕۆزیی ئێمەیە کەهەرگیز بڕانی بۆنیە، وەك ئەفەرمووێ: (عطاء غير مجذوذ) ١٠٨/١١. یان دەفەرموێ: (لهم أجر غير ممنون)٢٥/٨٤. یان

ئەفەرموێ: (أكلها دائم وظلها تلك عقبى الذين اتقوا وعقبى الكافرين النار)١٣/٣٥.بۆ جەخت لە سەر هەمان مەبەست.

**جێگەی لادەرانیش زۆر ناخۆشە:**

﴿٥٥ هذا وإن للطاغين لشر مآب﴾ ئەمە پاداشی تەقواکاران بوو, بۆ یاخییان و, لەسنوور دەرچووانیش هەیە خراپترین جێگا ﴿٥٦ جهنم يصلونها فبئس المهاد﴾ ئەویش دۆزەخە, دەچنە نێوی و ئەسوتێنرێن، خۆ دۆزەخیش لانکێکی زۆر نالەبارو خراپە﴿٥٧هذا فليذوقوه حميم وغساق﴾ ئەمە ئاوێکی کوڵبەکوڵ و,کێمێکە لە جەستەی دۆزەخیەکان دەچۆڕێ, جا بیچێژن ﴿٥٨ وآخر من شكله ازواج﴾ وەبۆیان هەیە سزاو جەزرەبەی تر,جگە لەو دوو



وَقَالُواْ مَا لَنَا لَا نَرَىٰ رِجَالٗا كُنَّا نَعُدُّهُم مِّنَ ٱلۡأَشۡرَارِ ٦٢ أَتَّخَذۡنَٰهُمۡ سِخۡرِيًّا أَمۡ زَاغَتۡ عَنۡهُمُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ ٦٣ إِنَّ ذَٰلِكَ لَحَقّٞ تَخَاصُمُ أَهۡلِ ٱلنَّارِ ٦٤ قُلۡ إِنَّمَآ أَنَا۠ مُنذِرٞۖ وَمَا مِنۡ إِلَٰهٍ إِلَّا ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ ٦٥ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡغَفَّٰرُ ٦٦ قُلۡ هُوَ نَبَؤٌاْ عَظِيمٌ ٦٧ أَنتُمۡ عَنۡهُ مُعۡرِضُونَ ٦٨ مَا كَانَ لِيَ مِنۡ عِلۡمِۭ بِٱلۡمَلَإِ ٱلۡأَعۡلَىٰٓ إِذۡ يَخۡتَصِمُونَ ٦٩ إِن يُوحَىٰٓ إِلَيَّ إِلَّآ أَنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٞ مُّبِينٌ ٧٠ إِذۡ قَالَ رَبُّكَ لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي خَٰلِقُۢ بَشَرٗا مِّن طِينٖ ٧١ فَإِذَا سَوَّيۡتُهُۥ وَنَفَخۡتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُواْ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ٧٢ فَسَجَدَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمۡ أَجۡمَعُونَ ٧٣ إِلَّآ إِبۡلِيسَ ٱسۡتَكۡبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٧٤ قَالَ يَٰٓإِبۡلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَن تَسۡجُدَ لِمَا خَلَقۡتُ بِيَدَيَّۖ أَسۡتَكۡبَرۡتَ أَمۡ كُنتَ مِنَ ٱلۡعَالِينَ ٧٥ قَالَ أَنَا۠ خَيۡرٞ مِّنۡهُ خَلَقۡتَنِي مِن نَّارٖ وَخَلَقۡتَهُۥ مِن طِينٖ ٧٦ قَالَ فَٱخۡرُجۡ مِنۡهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٞ ٧٧ وَإِنَّ عَلَيۡكَ لَعۡنَتِيٓ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ٧٨ قَالَ رَبِّ فَأَنظِرۡنِيٓ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ ٧٩ قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ ٱلۡمُنظَرِينَ ٨٠ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡوَقۡتِ ٱلۡمَعۡلُومِ ٨١ قَالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغۡوِيَنَّهُمۡ أَجۡمَعِينَ ٨٢ إِلَّا عِبَادَكَ مِنۡهُمُ ٱلۡمُخۡلَصِينَ ٨٣



جۆرە– لە چەشنی ئەم سزایە جۆرەها سزا, وەك زەمهەریرو, سەموم. ﴿٥٩ هـذا فـوج مقـتحم معكـم لا مرحبـا بهـم﴾ فریشتەکانی سزا ئەڵێن: بە سەرۆکەکان ئەمەش کۆمەڵێکن لەگەڵ ئێوە بەزۆر دەخرێنە دۆزەخ، سەرۆکەکانیش دەڵێن:ئای بە خێر نەیەن ﴿إنهم صالوا النار﴾ بەڕاستیی ئەوانیش هەر دەبێ لەناو ئاگردابن ﴿٦٠ قالوا بل انتم لا مرحبا بكم﴾ شوێنکەوتووەکانیش بە سەرکردە کانیان ئەڵێن: بەڵکو ئێوە لە خۆشییدا نەبن، یاخوا خۆتان بەخێر نەیەن! ﴿انتم قدمتموه لنا﴾ ئێوەن ئەم شوێنە خراپەتان بۆ ئێمە وەپێش هێنا ﴿فبئس القرار﴾ جا چ جێیەکیnالەباره ﴿٦١ قالوا ربنا من قدم لنا هذا﴾ شوێنکەوتووەکان ئەڵێن: پەروەردگاری ئێمە! هەرکەسێ ئەم سزایەی بۆ ئێمە وەپێش هێنا ﴿فزده عذابا ضعفا من النار﴾ تۆش بۆی زیاد بکە سزایەکی زیادە لە ئاگر، وەك دەفەرمووێ: (قالت اخراهم لأوليهم ربنا هؤلاء أضلونا فآتهم عذابا ضعفا من النار قال لكل ضعف ولكن لاتعلمون)٣٨/٧. ﴿٦٢ وقالوا ما لنا لا نرى رجالا كنا نعدهم من الأشرار﴾ دەشڵێن: ئەوەئاخۆ ئەو پیاوانەی کە ئێمە بەخراپ و نەگریسمان دائەنان بۆ چ نایان بینین؟! مەبەستیان لەبڕوادارەکانە. بەڵێ پیاوانێك وەك (ئەبوجەهل و ئەبو لەهەب) کە (عەممارو بیلال و صهیب) لە دۆزەخدا نابینن، لەیەکتر دەپرسن: باشە ئەوانە چییان لێهات؟! ﴿٦٣ اتخذناهم سخريا ام زاغت عنهم الأبصار﴾ ئێمە کاتی خۆی گاڵتەمان پێدەکردن لە دنیادا, ئایا ئێستا بێسەرو شوێنن؟ یان لەگەڵمانن و چاو لەبینینیان کوێڵە؟ ﴿٦٤ إن ذلك لحق تخاصم اهل النار﴾ بەڕاستیی ئەوەی بۆمان باسکردیت ئەی موحەممەد!ﷺ، هەق وڕاستە ودێتە دی: شەڕە قسەی دۆزەخیانە ﴿٦٥ قل إنما انا منذر﴾ بڵێ: من تەنها ترسێنەرێکم و هیچی تر ﴿وما من إله إلا الله الواحد القهار﴾ ئەمەتان پێ ڕائەگەیەنم کە یەك خوای تاك و تەنیا و زاڵ بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، ئیتر هیچ پەرستراوێکی تر بە هەق نیە ﴿٦٦ رب السموات والأرض وما

بينهما العزيز الغفار﴾ ئەوخوایە خاوەن وپەروەردگاری ئاسمانەکان و زەویی و ئەوەی نێوانیان ، بەدەسەلاتی لێبوردەیە.

### پەیامی پێغەمبەر ﷺ خەبەرێکی زۆر گرنگە:

﴿ ٦٧ قل هو نبأ عظيم﴾ بڵێ: ئەو قورئانەی بۆم هێناون هەواڵێکی زۆر گرنگ و گەورەیە ﴿ ٦٨ انتم معرضون﴾ کە ئێوە لەبەر نەزانینتان رووی لێ دەسوورێنن و، هیچ کەڵکی لێوەرناگرن ﴿ ٦٩ ما كان لى من علم بالملأ الأعلى إذ يختصمون﴾ کاتێ فریشتە باڵا نشینەکان لەبارەی دروستکردنی ئادەمەوە دەدوان، من هیچ هەواڵێکم نەبوو ئەگەر ئەو قورئانە نەبوایە ﴿ ٧٠ إن يوحى إلى إلا انما انا نذير مبين﴾ بە وەحیی پێم رادەگەیەنرێ کە من بە ئاشکرا ترسێنەرم و خوا ناردومی بۆ ئەوەی ئێوە لەسزای ئەو بترسێنم، جا کەوابوو ئاگایی من تەنها لەڕووی وەحیی و نیگاوەیە.

### سەرگروشتەکەی بابە (ئادەم) و ئیبلیس:

﴿ ٧١ إذ قال ربك للملائكة إنى خالق بشرا من طين﴾ ئەو دەمە کە پەروەردگاری تۆ بەفریشتەکانی فەرموو: وا لەقوڕ بەشەرێك، واتە: ئادەم ﷺ دروستدەکەم بەیاد بکە. بەڵێ ئەم داستانەی (ئادەم)ی پێغەمبەر (علیه السلام) هاوڕێ لەگەڵ باسی شەیتان لە سوورەتی (بەقەرە)، (ئەعراف، حجر، سبحان، کەهف) هاتووە. ﴿ ٧٢ فإذا سويته ونفخت فيه من روحى﴾ ئینجا کاتێ لەشیم ڕێك و پێك کردو لەڕۆحی خۆم گیانم بەبەردا کرد ﴿فقعوا له ساجدين﴾ ئێوەش هەمووتان سوژدەو کرنووشی ڕێزی بۆ بەرن ﴿ ٧٣ فسجد الملائكة كلهم اجمعون﴾ ئەوسا فریشتەکانیش گشتیان سوژدەو کرنووشیان بۆ برد ﴿ ٧٤ إلا إبليس استكبر وكان من الكافرين﴾ مەگەر (ئیبلیس)ی شەیتان نەبێ ,کە خۆی لێگۆڕاو دەعیەچیو دەماریاز بوو، سپڵەیی کرد ﴿ ٧٥ قال يا إبليس ما منعك أن تسجد لما خلقت بيدى﴾ خوا فەرمووی:ئەرێ ئیبلیس! چی ڕێی لە تۆ گرت کرنووش بەری بۆ ئەوەی کە بەدوو دەستەی خۆم دروستم کردووە؟ ﴿ أستكبرت أم كنت من العالين﴾ ئایا خۆت لاگەورە بوو ,یا لەپلە بەرزان بوویت؟ و سوژدەت بەشیاوی خۆت نەزانی؟ ﴿ ٧٦ قال أنا خير منه﴾ شەیتان وتی: دیارە من لەو خۆم بە چاکترو باشتر دەزانم ﴿ خلقتنى من نار وخلقته من طين﴾ چونکە تۆ منت لەئاگر, ئەویشت لەگڵ و قوڕ, دروستکردووە ﴿ ٧٧ قال فاخرج منها فإنك رجيم﴾ خوا فەرمووی: دەسا لەڕیزی فریشتەکان بڕۆرە دەرێ، هەر لەئێستاوە تۆ دەرکراو و دوورخراوەیت لەرەحمەتم ﴿ ٧٨ وإن عليك لعنتى إلى يوم الدين﴾ وە تا ڕۆژی پاداشت و زیندوو بوونەوەش، نەفرینی منت لەسەربێ، جا ئەو کاتەش ئەوقەی سزای توندتر ئەبیت ﴿ ٧٩ قال رب فانظرنى إلى يوم يبعثون﴾ شەیتان وتی: ئەی پەروەردگاری من! کات و مۆڵەتم بدە تا ڕۆژێ کە مرۆڤەکان هەموو زیندوو ئەکرێنەوە ﴿ ٨٠ قال فإنك من المنظرين﴾ خوا فەرمووی: دە تۆ لەمۆڵەتدراوانیی, تا نەفخەی یەکەم و، تەواوی گیانلەبەرانیش نەمرن ﴿إلى يوم الوقت المعلوم﴾ هەتا ئەو ڕۆژەو ئەوکاتەی دیاریکراوە هەر دەمێنیتەوە ﴿ ٨٢ قال فبعزتك لأغوينهم اجمعين﴾ شەیتان وتی: دەسا بەعیززەت و دەسەڵاتی تۆ، ئەوانە هەموو فریو دەدەم و لەخشتەیان ئەبەم ﴿ ٨٣ إلا عبادك منهم المخلصين﴾ مەگەر ئەو بەندانەت کە تۆبەپاکی دەپەرستن "ئەوانە خۆت ئەیانپارێزی و، من ,دەسەڵاتم بەسەریاندا نییە، ئایەتی: (لئن أخرتنى إلى يوم القيامة لأحتنكن ذريته إلا قليلا)٦٢/١٧. وە ئایەتی: (إن عبادى ليس لك عليهم سلطان وكفى بربك وكيلا)٦٥/١٧. هەر پشتگیری ئەو ڕاستییەن. ﴿ ٨٤ قال فالحق والحق اقول﴾ خوا فەرمووی بە شەیتان: جا بەهەق و ڕاستیی سوێند، وەهەر هەقیش ئەڵێم: ﴿ ٨٥ لأملأن جهنم منك وممن تبعك منهم اجمعين﴾ دڵنیابە، تۆش و هەموو ئەوانەش شوێنی تۆ

کەوتوون جەهەندەمتان لیٚ پڕ ئەکەم ﴿ ^٨٦ قل ما اسألكم عليه من اجر﴾ - ئەی موحەممەد ﷺ- پێیان بڵێ: لەپێناوی ڕاگەیاندنی پەیامەکەمدا, من هیچ پاداشێکم لەئێوە ناویٚ ﴿وما انا من المتكلفين﴾ وەمن لەوانەیش نیم کە درۆ لەسەرخوا هەڵدەبەستن. واتە: لە خۆمەوە داوای پەیامبەریٚتی ناکەم ﴿ ^٨٧ إن هو إلا ذكر للعالمين﴾ ئەو قورئانەیەش هەر پەندو ئامۆژگارییە بۆتەواوی جیهانەکان ﴿ ^٨٨ ولتعلمن نبأه بعد حين﴾ بەهەقیقەت دوای ماوەیەکی دیکە لەهەواڵی ڕاستیی ئەو ئاگادار ئەبی، جا ئەو کاتە بۆتان دەرئەکەویٚ کە ئەو قورئانە چەندە گرنگ و بایەخدارەو هەواڵەکانیشی وەك گزنگی بەرەبەیان ئەدرەوشێنەوە.

لە (٢٤)ی (ربيع الأول)ی (١٤١٧)ك بەرامبەر بە(١٩٩٦/٨/٩) دوای نوێژی بەیانی لە (ڕاگەیاندنی بزووتنەوەی ئیسلامیی) لەنووسینی ئەم سوورەتە بوومەوە. زۆر زۆر سوپاس بۆ خوای دلۆڤان.

*** *** ***


الجزء الثالث والعشرون — سورة الزمر

قَالَ فَٱلۡحَقُّ وَٱلۡحَقَّ أَقُولُ ٨٤ لَأَمۡلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكَ وَمِمَّن تَبِعَكَ مِنۡهُمۡ أَجۡمَعِينَ ٨٥ قُلۡ مَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٖ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُتَكَلِّفِينَ ٨٦ إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ لِّلۡعَٰلَمِينَ ٨٧ وَلَتَعۡلَمُنَّ نَبَأَهُۥ بَعۡدَ حِينِۭ ٨٨

سُورَةُ الزُّمَرِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَكِيمِ ١ إِنَّآ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ فَٱعۡبُدِ ٱللَّهَ مُخۡلِصٗا لَّهُ ٱلدِّينَ ٢ أَلَا لِلَّهِ ٱلدِّينُ ٱلۡخَالِصُۚ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَ مَا نَعۡبُدُهُمۡ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلۡفَىٰٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَحۡكُمُ بَيۡنَهُمۡ فِي مَا هُمۡ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي مَنۡ هُوَ كَٰذِبٞ كَفَّارٞ ٣ لَّوۡ أَرَادَ ٱللَّهُ أَن يَتَّخِذَ وَلَدٗا لَّٱصۡطَفَىٰ مِمَّا يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُۚ سُبۡحَٰنَهُۥۖ هُوَ ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ ٤ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِٱلۡحَقِّۖ يُكَوِّرُ ٱلَّيۡلَ عَلَى ٱلنَّهَارِ وَيُكَوِّرُ ٱلنَّهَارَ عَلَى ٱلَّيۡلِۖ وَسَخَّرَ ٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَۖ كُلّٞ يَجۡرِي لِأَجَلٖ مُّسَمًّىۗ أَلَا هُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡغَفَّٰرُ ٥

٤٥٨ خلقكم من

## ٣٩- سوورەتی (زومەر)ـە
## مەککەییەو (٧٥) ئایەتە

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

ئەم سوورەتە بەخەستی باسی یەکخواپەرستیی ئەکات، بەشێوەیەك خەریکە ئەوە ببێتە تەوەرەی سەرەکیی باسەکەی، خۆجێگەی خۆشیەتی ئاوابێت، چونکە یەکخواپەرستیی بناغەی عەقیدەیەکی بێخەوش و بێ لەکەیە. ئینجا باسێکی قورئانیش دەکاکە: چۆن بۆتە موعجیزەیەکی هەتاهەتایی بۆهەموو گەلان. پاشان دەست ئەکات بەبەڵگە هێنانەوە لەسەر یەکخواپەرستیی، بەجۆرەها بەڵگە، لەگەڵ باسکردنی جیاوازییەکی زۆر لەنێوان یەکخواپەرستیی و، بتپەرستییدا، لەدواییشدا بەوشەیەکی تەڕی پاراوو ناسك ,داوا لەبەندەکانی خوا ئەکات کە زۆربەزوویی بگەڕێنەوە بۆلای خوا.

جا بۆ گەورەیی ومەزنی سوورەتی (زومەر)ـە، ئەم فەرمووده -کە ئیمامی (نەسائیی) لە خاتوو (عائیشە)وە دەیگێڕێتەوەو - دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئەوەندە بێوچان بەڕۆژوو دەبوو دەمان وت: پێدەچیٚ ڕۆژیٚ نەبێت تێیدا بە ڕۆژو نەبیٚ، ئەوەندەیش ئیسراحەتی دەکردو بەڕۆژوو نەدەبوو ئەمانوت: لەوانەیە ئیتر قەت ڕۆژوو نەگریٚ،(واتە:پێغەمبەری خوا مافی نەفسیی وخانەوادەیی و میوانیی ڕەچاودەکرد لە ڕۆژوگەتنەکەدا) وەهەموو شەوێکیش سوورەتی (بەنی ئیسرائیل و، سوورەتی زومەر)ی دەخوێند، ئەم سوورەتە کۆتاییشی بەباسێکی نەفخەی یەکەم دێت، پاشان زیندووبوونەوەو پاداشت و تۆڵەو..هتد.

## فەرماندان بەیەکتا پەرستی و, رەتکردنەوەی شیرک:

﴿بسم الله الرحمن الرحيم * [١] تنزيل الكتاب من الله العزيز الحكيم﴾ دابەزاندنیئەم کتێبە لەلایەن خوای بەدەسەڵاتیکار جوانەوەیە ﴿[٢] إنا انزلنا إليك الكتاب بالحق﴾ بێگومان ئێمە ئەم کتێبەمان بەڕاست وهەق بۆ تۆ دابەزاند, جا کەوایە هیچ گومان و ناتەواوییەکی تێدا نیەو، هەمووی هەق و دروستە ﴿فاعبد الله مخلصا له الدين﴾ جا خودا بپەرستە بە پوختی و,ئاینداری بۆ ئەو، واتە:قەت بتمەپەرستە ﴿[٣] الا لله الدين الخالص﴾ هۆشیاربە! ئایینی پاك وچاك و بێگەرد تەنها هی خوایە. واتە: خوا تەنها هەر ئیخلاص وەرئەگرێ و، هەرشتێکی دی وەلا دەنێ ﴿والذين اتخذوا من دونه أولياء﴾ ئەوانەی کە لەباتی خوا چەند دۆس و بتێکیان بۆ خۆیان گرتووە، وەبەبێ هیچ بەڵگەیەکیش ئەڵێن: ﴿ما نعبدهم إلا ليقربونا إلى الله زلفى﴾ ئێمە هەر بۆئەوە ئەو بتانە دەپەرستین، کە لەخوامان نزیك بکەنەوەو , تکامان بۆ بکەن لای, کەچی ئەگەر پێیان بوترایە: ئەی کێ ئێوەی دروستکردووە؟ ئەی کێ ئاسمانەکان و زەوی وەدیهێناوە؟ لەوەڵامدا ئەڵێن: هەر (الله)یە، ئیتر پێیان ئەوترا: ئەی بۆچیخوا بەتاك وتەنیا ناپەرستن؟ وشەی (مانعبدهم..) وەڵامیان بوو. ﴿إن الله يحكم بينهم فيماهم فيه يختلفون﴾ جا با هەر وابکەن بێگومان خوا هەق و ناهەق جیا ئەکاتەوەو، بڕیاری خۆی دەربارەی ئەو دوو بەرەکیەی نێوانیان دەدات,ئەو کات موسڵمانان ئەچنە بەهەشتەوەو، بێ بڕوایانیش بۆ دۆزەخ ئەنێردرێن ﴿إن الله لا يهدي من هو كاذب كفار﴾ دیارە ئەوجۆرە کەسانە گومڕاو سەر لێشێواون , خۆبەڕاستیی خوایش مرۆی درۆزن و سپڵە ڕێنوێن ناکا ﴿[٤] ولو أراد الله ان يتخذ ولدا﴾ یەکێ لەدرۆکانیان ئەوەبوو کە خوا منداڵی بۆ خۆی ڕاگرتووە! خۆ ئەگەر خوا بیویستبا منداڵ بۆخۆی بڕیار بدات ﴿لاصطفى مما يخلق ما يشاء﴾ بەئارەزووی خۆی چی پێ باش بووبا بەپێی باوونەریت, لەنێو دروستکراوەکانی خۆیدا ئەوەی هەڵدەبژاردو ئەیکردە منداڵی خۆی ﴿سبحانه﴾ پاکیی و بڵندی هەر بۆ ئەوە، چونکە لەو شتانە ئەو بێ نیازە ﴿هو الله الواحد القهار﴾ هەرئەو (الله)یە خوای تاك و تەنیاو بێ هاوەڵ و بەدەسەڵات و بە زەبرو,بێپێویست بەهیچ شتێك.

## بەڵگە گەلێ بۆ تاك و تەنیایی و توانایی خوا:

﴿[٥] خلق السموات والأرض بالحق﴾ ئەوە بەهەق و دروست ئاسمانەکان و زەوی بەدی هێناوە ﴿يكور الليل على النهار ويكور النهار على الليل﴾ دەسەڵاتدارێکی وەهایە شەو لەرۆژ ئەپێچێ و، رۆژیش لەشەو ئەپێچێ, وەك پێچی مێزەر، بەشێکی بەسەر بەشێکیا دەپێچرێ, واتە: دەیانهێنێ بەشوێن یەکدا, یەکێکیان تاریك دەکاو ,ئەوی تریان رووناك, ئایەتی: (يغشى الليل النهار يطلبه حثيثا)٥٤/٧. ئەومایە دووپات ئەکاتەوە. هەندێ ئەڵێن: مەبەست بە (تكوير) خڕیی گۆی زەوییە، یان سووڕانەوەیەتی بە دەوری خۆیدا، بەڵام خوا خۆی باشتر ئەزانێ ﴿وسخر الشمس والقمر﴾ و خۆرو مانگیشی کەویی و رامکرد ﴿كل يجري لأجل مسمى﴾ هەریەك لەوانەش تا کاتی دیاریکراو بۆ کۆتایی دنیا دەگەڕێن، دێن و دەڕۆن ﴿الا هو العزيز الغفار﴾ هۆشیار بە! دەسەڵاتدار و بەتوانا, خەتا پۆش و لێبوردە هەرخۆیەتی ﴿[٦] خلقكم من نفس واحدة﴾ ئێوەی لەیەك کەس – باوە ئادەم – دروستکرد ﴿ثم جعل منها زوجها﴾ پاشان هاوسەرەکەیشی – دایە حەوا – (لە ماك و جۆری ئەو نەفسە) دروستکرد. (روح المعاني) ئەڵێت: (من) لە (جعل منها)دا بۆ (إبتداء)یە، واتە: هاوسەرەکەیشی هەر لەو تەحرەی باوەئادەمە بەدیهێنا, جا کەواتە دەبێ خاتوو حەوایش هەر لەپاشماوەی ئەو گڵە دروست کرابێ کەئادەمی لێدروست کراوە، نەك لەپەراسووی ئەو، هەندێکی دیکە دەڵێ: (من) بۆ (تبعيض)ە. واتە حەوا لە تەن و لەلەشی باوەئادەم دروستکراوە: وەك ئەم ریوایەتە

ئەڵێت: (حەوا) لەپەراسووی ئادەم دروستکرا. شیاوی باسە " تەفسیری نموونە "یش دان بەوەدا دەنێت کە خاتو حەوا هەر لە پاشماوەی گڵەکەی باوەئادەم دروستکراوە. ﴿وانزل لكم من الأنعام ثمانية أزواج﴾ لەماڵاتیشدا بۆخۆشگوزەرانی ئێوە هەشت جووتی بۆ وەدی هێناون: وشترو گاو، مەڕو بزن و، نێرو مێکانیان, ئایەتی: (ثمانية أزواج من الضأن اثنين ومن المعزاثنين) روونکردنەوەی ئەومەبەستەیە ﴿يخلقكم في بطون أمهاتكم خلقا من بعد خلق﴾ لەسکی دایکتانادروستان دەکا,بەدروستکردن لەدوای دروستکردن: لە پێشدا لەتنۆکە ئاوێك، پاشان لەخوێنپارە,پاشان لە گۆشتپارە.. هتد ﴿في ظلمات ثلاث﴾ لە سێ تارییکاندا: تاریکی سك، تاریکی مناڵدان، تاریکی پۆرگ, ئەمانە گشت لەبەرپاراستن ومانەوەی منداڵەکەیە ﴿ذلكم الله ربكم له الملك﴾ پەروەردگارو بەدیهێنەرتان، دەسەڵات وخاوەنێتی هەموو بوونەوەر هەر هی ئەوە ﴿لا إله إلا هو﴾ ئەو خوایە(الله)یە، جگە لەویش هیچ پەرستراوێکی هەق نیە ﴿فأنى تصرفون﴾ جا ئیتر چۆن لادەدرێن لە یەکخواپەرستی, بۆدوانە پەرستی و فرە خوا پەرستی؟!

**خوا لە شیرك تورەیە:**

﴿[7] إن تكفروا فإن الله غني عنكم﴾ ئەرسپێڵەو بێ بڕوا و پێ نەزانبن، ئەوە بێگومان خوا لێتان بێ نیازە و,ناشتوانن هیچ زیانێکی لێبدەن, ئەرخۆ کلاکن , وەك ئەفەرموێ: (إن تكفروا انتم ومن في الأرض جميعا فإن الله لغني حميد)٨/١٤. ئەم فەرموودەیشە کە دەفەرموێ: ((يا عبادي لو أن أولكم وآخركم وإنسكم وجنكم كانوا على أفجر قلب رجل منكم مانقص ذلك من ملكي شيئا))موسلیم. ئەگەر گش ئینسان و جنۆکەکان یەکدەست و، یەك دڵ بن لەسەر خراپەکاریی، هیچ زیانێ بەخوا ناگا. هەربۆ دووپاتی بێ نیازی خوایە. ﴿ولا يرضى لعباده الكفر﴾ وەخودا بەکوفرو بێ دینی بەندەکانی، رازیی و خۆشنوود نییە ﴿وإن تشكروا يرضه لكم﴾ ئەگەر سوپاسی چاکە کانیشی بکەن لەباتی بێباوەڕیی لێتان رازیی دەبێ ﴿ولا تزر وازرة وزر اخرى﴾ دیارە هیچ کەسیش باری گوناهی کەسێکیتر هەڵناگرێ, هەموو کەس بەپێی کردەی خۆی پاداشت و تۆڵە وەرئەگرێ ﴿ثم إلى ربكم مرجعكم﴾ پاشان گەڕانەوەتان بۆلای خاوەندتانە ﴿فينبئكم بما كنتم تعملون﴾ ئەوجا ئاگادارتان ئەکات لەهەرچی کردووتانە ﴿إنه عليم بذات الصدور﴾ چونکە خوا لە نهێنی دڵەکانیش -چاك وخراپی-بە ئاگایە.

**نالەباری ئینسان:**

﴿[8] وإذا مس الإنسان ضر دعا ربه منيبا إليه﴾ ئینسان سروشتی وایە کاتێ تەنگانەو ناخۆشییەکی تووش دەبێ، روو لە پەروەدگاری دەنێ و داوای لابردنی لێئەکات، ئایەتی: ١٧/٦٧. (وإذا مسكم الضر في البحر ضل من

الجزء الثالث والعشرون — سورة الزمر

خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ ثُمَّ جَعَلَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَأَنزَلَ لَكُم
مِّنَ ٱلۡأَنۡعَٰمِ ثَمَٰنِيَةَ أَزۡوَٰجٖۚ يَخۡلُقُكُمۡ فِي بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمۡ
خَلۡقٗا مِّنۢ بَعۡدِ خَلۡقٖ فِي ظُلُمَٰتٖ ثَلَٰثٖۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمۡ لَهُ
ٱلۡمُلۡكُۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ فَأَنَّىٰ تُصۡرَفُونَ ٦ إِن تَكۡفُرُواْ فَإِنَّ
ٱللَّهَ غَنِيٌّ عَنكُمۡۖ وَلَا يَرۡضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلۡكُفۡرَۖ وَإِن تَشۡكُرُواْ يَرۡضَهُ
لَكُمۡۗ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٞ وِزۡرَ أُخۡرَىٰۚ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم مَّرۡجِعُكُمۡ
فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَۚ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ٧
۞ وَإِذَا مَسَّ ٱلۡإِنسَٰنَ ضُرّٞ دَعَا رَبَّهُۥ مُنِيبًا إِلَيۡهِ ثُمَّ إِذَا خَوَّلَهُۥ
نِعۡمَةٗ مِّنۡهُ نَسِيَ مَا كَانَ يَدۡعُوٓاْ إِلَيۡهِ مِن قَبۡلُ وَجَعَلَ لِلَّهِ أَندَادٗا
لِّيُضِلَّ عَن سَبِيلِهِۦۚ قُلۡ تَمَتَّعۡ بِكُفۡرِكَ قَلِيلًا إِنَّكَ مِنۡ أَصۡحَٰبِ
ٱلنَّارِ ٨ أَمَّنۡ هُوَ قَٰنِتٌ ءَانَآءَ ٱلَّيۡلِ سَاجِدٗا وَقَآئِمٗا يَحۡذَرُ
ٱلۡأٓخِرَةَ وَيَرۡجُواْ رَحۡمَةَ رَبِّهِۦۗ قُلۡ هَلۡ يَسۡتَوِي ٱلَّذِينَ يَعۡلَمُونَ وَٱلَّذِينَ
لَا يَعۡلَمُونَۗ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ٩ قُلۡ يَٰعِبَادِ ٱلَّذِينَ
ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمۡۚ لِلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٞۗ
وَأَرۡضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةٌۗ إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّٰبِرُونَ أَجۡرَهُم بِغَيۡرِ حِسَابٖ ١٠

٤٥٩

تدعون إلا أياه فلما نجاكم إلى البر أعرضتم وكان الإنسان كفورا) پشتگيری لەومانايه دكات. ﴿ثم إذا خوله نعمة منه﴾ پاشان كاتێكيش لەلايەن خۆيەوە نيعمەتێكیپێدا ﴿نسى ماكان يدعوا إليه من قبل﴾ ئيترئەمە لەبير دەكات كەلەوەوبەر لەخوا ئەپاڕايەوە ڕزگاری بكات، ئايەتی: (وإذا مس الإنسان الضر دعا لجنبه أو قاعدا أو قائما فلما كشفنا عنه ضره مر كأن لم يدعنا إلى ضر مسه)١٢/١٠. دووپاتی ئەو ڕاستیيه ئەكاتەوە. ﴿وجعل لله اندادا ليضل عن سبيله﴾ وەچەند هاوبەش و شەريكێك بۆخوا دادەنێن، هەتا جگە لەخۆيشی خەڵكی گومڕا بكات لەڕێی خوا و، نەهێڵێ بەرەوڕێی ئەو بچن ﴿قل تمتع بكفرك قليلا﴾ بڵێ: بەوكەسە بیێ بڕوايە، كەمێكیتريش بەو تەمەنە كەمەوە، لەزەت ببەو ڕابوێرە لەدنيادا ﴿إنك من اصحاب النار﴾ چونكە تۆ بەڕاستيی لە يارانی ئاگرييت.

**مرۆڤی بەرفەرمان و ياخيی وەكو يەك نين:**

﴿٩ امن هو قانت آناء الليل ساجدا وقائما﴾ ئاخۆ ئەو كەسەی كە لەساتەكانی شەوگاردا بە پێوە ڕاوەستاوەو هەردەم سوژدە دەبا بۆخوا ﴿يحذر الآخرة ويرجوا رحمة ربه﴾ لەسزای پاشە ڕۆژيش ئەترسێ و خۆئەپارێزێ، وە ئومێديشی بە بەزەيی پەروەردگاری خۆيەتی وبەتەمای بەهەشتە، دەئايا كەسێكی وا وەكو ئەوكەسە وايە سەر پێچيكاربێ؟!. (عەبدوڵڵای كوڕی عومەر) دەڵێ: ئەوكەسەی كەئايەتەكە باسی ئەكا، هەر (عوسمانی كوڕی عەففان)ە، چونكە هەرئەوبوو كەشەوگاری خۆی بەنوێژو قورئان خوێندنەوە دەبردە سەر، تەنانەتی، دەڵێن: لە تەنها ركاتێكدا تەواوی قورئانیخوێندووە! (ئيبن كەسير). لە پاشا دوو نموونە بۆ ئەو دوانە دێنێتەوەودەفەرموێ: ﴿قل هل يستوى الذين يعلمون والذين لا يعلمون﴾ بڵێ:ئايا ئەو كەسانەی كە زانان وشارەزان لەگەڵ ئەو كەسانەدا كە نەزان ونەشارەزان يەكسانن؟! "دیارە هەرگيز يەكسان نين، جا هەربەو جۆرەيش مرۆڤی چاك و خراپ، بڕوادارو بێ بڕوا" ﴿إنما يتذكر أولوا الألباب﴾ بۆ سەلماندنی ئەو ڕاستيە تەنها مرۆڤە ژيرەكان بير دەكەنەوەو ئامۆژگاری وەردەگرن.

**فەرمان بەتەقواو هيجرەت و پوختخواپەرستی:**

﴿١٠ قل يا عبادى الذين آمنوا اتقوا ربكم﴾ ئەی پێغەمبەر! بەبەندەكانم بڵێ: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! خۆتان لە نافەرمانی و سەرپێچی پەروەدگارتان بپارێزن و، فەرمانەكانی بەجێ بێنن ﴿للذين احسنوا فى هذه الدنيا حسنة﴾ بۆ ئەوانەی كە لەم دونيايەدا چاكەيان ئەنجام داوە، پاداشتێكی چاكيان بۆ هەيە. پاشان ئەيەوێ هيجرەتيان پێبكاو ناوەندی شيرك بەجێ بهێڵن، بۆيە ئەفەرمووێ: ﴿وأرض الله واسعة﴾ ئاشكرايە كە زەويی خوا فراوانە، جاكەواتە ئێوە لە (دار الكفر)ەوە بچن بۆ (دار السلام)، وە لەهەر جێگايەكدا نەتوانن خواپەرستيی چاك بكەن بەجێی بهێڵن، ديارە لەو پێناوەدا ئێوە تووشی گەلێ ئازارئەبن، بۆيە ئەفەرموێ: ﴿إنما يوفى الصابرون اجرهم بغير حساب﴾ ئارامگربن لەسەر كۆچ ودووری لە زێدو خۆشەويستان، بەڕاستی بە ئارامگرەكان پاداشی بێژمارە دەدرێتەوە ﴿١١ قل إنى امرت ان أعبد الله مخلصا له الدين﴾ بڵێ: بەڕاستيی من فەرمانم پێدراوە كە خوايەكی تاك وتەنيا(الله) بپەرستم و، بەپوختی ئايين و پەرستن بۆ ئەو بكەم ﴿١٢ وامرت لأن اكون أول المسلمين﴾ فەرمانيشم پێدراوە كە يەكەمين موسڵمان و ملكەچ بم بۆ خوا لەناو ئەم ئوممەتەدا.

**ترساندن لە جەزرەبەی ڕۆژی سەلا:**

﴿١٣ قل إنى أخاف إن عصيت ربى عذاب يوم عظيم﴾ بڵێ بەڕاستيی من لەسزای ڕۆژێكی گەورە ئەترسم بۆتان ئەگەر سەرپێچی پەروەردگاری خۆم بكەم. ﴿١٤ قل الله أعبد مخلصا له دينى﴾ بڵێ: من هەر خوا(الله) ئەپەرستم،بە

پوختی ئایین وپەرستن بۆ ئەو. پاش ئەوەدیسانەوە داوای دڵسۆزیی و یەکلا بوونەوە دەکا بۆخوا، هاوڕێ لەگەڵ فرێدانی هەموو شتێکی نەگونجاو لەگەڵ دینی خوادا بۆیە بە هەڕەشەوە ئەفەرموێ: ﴿ [١٥] فاعبدوا ماشئتم من دونه﴾ پێیان بڵێ: جائێوەش هەرچی دەپەرستن -جگە لەخوا- بیپەرستن ﴿قل إن الخاسرين الذين خسروا انفسهم واهليهم يوم القيامة﴾ بڵێ: بەڕاستی زیانمەندانی راستە قینە هەر ئەوانەن کەلەڕۆژی قیامەتدا سەرمایەی خۆیان وماڵو منداڵیان دەدۆڕێنن ودەچنە دۆزەخەوە ﴿الا ذلك هو الخسران المبين﴾ هۆشیاربن! هەرئەوە زیانی ئاشکراو نمایانە، دەسائێوەش خۆتان بپارێزن لێی ﴿ [١٦] لهم من فوقهم ظلل من النار ومن تحتهم ظلل﴾ لەپاشە ڕۆژیشدا لە ژوور سەریانەوە توێ لەسەرتوێکڵپەی ئاگر وەستاوە، لەژێریشیانەوە بەو جۆرە. ئاگر پارچە پارچە ئەکەوێتە سەریەك و سێبەر ئەکات، ئەوانیش لەسێبەرەکەیدان!! ﴿ذلك يخوف الله به عباده﴾ خوا بەو وێناکردنە بۆ ئاگر،بەندەکانی بەوە ئەترسێنێو هۆشیاریان ئەکاتەوە ﴿يا عباد فاتقون﴾ دەسائەی بەندەکانم! لەنافەرمانی من پارێز بکەن، شتێ مەکەن ببێتە مایەی سزادانتان ﴿ [١٧] والذين اجتنبوا الطاغوت أن يعبدوها﴾ و ئەوانەی کەلەپەرستنی بت، شەیتانی زۆر سەرکێش تەکیینەوەو خۆیان پاراست کە بیپەرستن ﴿وانابوا إلى الله﴾ گەڕاونەوە بۆلای خوا و، هەرئەویان پەرست ﴿لهم البشرى﴾ خۆشییو موژدەیان بۆ هەیە لەدنیاو لە ئاخیرەتدا. بەڵێ دوور کەوتنەوە لەتاغوتان: واتە: لەهەر جۆرە شیرك و بت پەرستییو هۆپەرستییو، شەیتان پەرستییو پەیڕەوی کردن لەهەر حاکم ودەسەڵاتدارو وستەمکارێکی سەردەم ئاینداری پوختەیە ﴿فبشر عباد * [١٨] الذين يستمعون القول﴾ ساتۆش موژدە بەبەندەکانی من بدە، ئەوانەیان گوێ دەدەنە قسەو گفتو گۆ ﴿فيتبعون احسنه﴾ جابەشوێن چاکتریدا دەچن وپەیڕەوی لێ ئەکەن. (ئیبن عەباس) ئەڵێ: مەبەست ئەوپیاوەیە کە گوێی لە چاك لەخراپەوە ئەبێ بەڵام ئەو پەیرەوی لەچاکەکە ئەکاو، واز لە خراپەکە دێنێ. هەندێ ئەڵێن: ئەوپیاوەیە کە قورئان وغەیری قورئان ئەبیسێ، پاشان گوێ هەربۆ قورئانەکە ئەگرێ. هەندێکی دیکە ئەڵێن: مەبەست ئەوکەسەیە کە هەم مافی تۆڵەو، هەم مافیلێبوردنی هەیە، کەچی ئەو تۆڵە ناسێنێو دەبوورێ ﴿اولئك الذين هداهم الله﴾ ئەوانەن کەخوا بەرەوخۆی ڕێنومایی کردو ون بۆئەوەی خۆی پێیخۆشە ﴿واولئك هم اولوا الألباب﴾ هەرئەوانەشن ژیرو ئامیدەو خاوەن ئاوەز ﴿ [١٩] أفمن حق عليه كلمة العذاب﴾ جائایا کەسێك فەرمانی سزای بۆ دەرچوو بێ لەلایەن خواوە بەهۆی لاساریی خۆیەوە؟ ﴿افانت تنقذ من فى النار﴾ تۆ دەتوانی کەسێکیوا لەناو ئاگردابێ ڕزگار بکەیت؟ ﴿ [٢٠] لكن الذين اتقوا ربهم﴾ بەڵام ئەوانەی کەخۆیان لەنافەرمانی پەروەردگاریان دەپارێزن ﴿لهم غرف من فوقها غرف مبنية﴾ چەندان کۆشك وتەلارو باڵەخانە لەسەر باڵەخانە یان لەبەهەشتدا بۆ هەیە لەیاقوت و زوبەرجەد ﴿تجرى من تحتها

الجزء الثالث والعشرون — سورة الزمر

قُلْ إِنِّيٓ أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ ٱللَّهَ مُخْلِصًا لَّهُ ٱلدِّينَ ﴿١١﴾ وَأُمِرْتُ لِأَنْ أَكُونَ
أَوَّلَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿١٢﴾ قُلْ إِنِّيٓ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ
﴿١٣﴾ قُلِ ٱللَّهَ أَعْبُدُ مُخْلِصًا لَّهُۥ دِينِي ﴿١٤﴾ فَٱعْبُدُوا۟ مَا شِئْتُم مِّن دُونِهِۦ
قُلْ إِنَّ ٱلْخَٰسِرِينَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَأَهْلِيهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ أَلَا
ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْخُسْرَانُ ٱلْمُبِينُ ﴿١٥﴾ لَهُم مِّن فَوْقِهِمْ ظُلَلٌ مِّنَ ٱلنَّارِ
وَمِن تَحْتِهِمْ ظُلَلٌ ذَٰلِكَ يُخَوِّفُ ٱللَّهُ بِهِۦ عِبَادَهُۥ يَٰعِبَادِ فَٱتَّقُونِ ﴿١٦﴾
وَٱلَّذِينَ ٱجْتَنَبُوا۟ ٱلطَّٰغُوتَ أَن يَعْبُدُوهَا وَأَنَابُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ
فَبَشِّرْ عِبَادِ ﴿١٧﴾ ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ
أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمْ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٨﴾
أَفَمَنْ حَقَّ عَلَيْهِ كَلِمَةُ ٱلْعَذَابِ أَفَأَنتَ تُنقِذُ مَن فِي ٱلنَّارِ ﴿١٩﴾
لَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ رَبَّهُمْ لَهُمْ غُرَفٌ مِّن فَوْقِهَا غُرَفٌ مَّبْنِيَّةٌ تَجْرِي
مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ وَعْدَ ٱللَّهِ لَا يُخْلِفُ ٱللَّهُ ٱلْمِيعَادَ ﴿٢٠﴾ أَلَمْ تَرَ
أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَسَلَكَهُۥ يَنَٰبِيعَ فِي ٱلْأَرْضِ ثُمَّ
يُخْرِجُ بِهِۦ زَرْعًا مُّخْتَلِفًا أَلْوَٰنُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصْفَرًّا ثُمَّ
يَجْعَلُهُۥ حُطَٰمًا إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِأُو۟لِي ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٢١﴾

أفمن شرح ٤٦٠

﴿الأنهار﴾ رووبارو چۆمە ئاوی زۆر بەبەردەمیا دەڕوا ﴿وعد الله لا یخلف الله المیعاد﴾ ئەمە بەڵێنی خوایە، خوایش هەر بەڵێنیٚ بدا، پێچەوانەکەی رەفتار ناکات.

**مەسەل و وێنەی ژیانی دنیا:**

﴿[21] الم تر ان الله انزل من السماء ماء﴾ ئایا نەتبینی کەخوا.. لەو ئاسمانەوە ئاوێکی دابەزاندووە ﴿فسلکه ینابیع فی الأرض﴾ جا ئاوە بارانەکەی خستە ناو کانیاوەکان لە زەوییدا، واتە: باراناوەکان دەبنە کانیاو بۆتان ﴿ثم یخرج به زرعا مختلفا الوانه﴾ پاشان کشتوکاڵی ڕەنگاو ڕەنگی پیٚ ئەڕوێنیٚ ﴿ثم یهیج فتراه مصفراً﴾ دواتر وشک دەبیٚ، جادەیبینی بە زەرد هەڵگەڕاوی ،پاش ئەوەی کەچەند سەوزوجوان بوو ﴿ثم یجعله حطاما﴾ ئەوساوردو خاشیدەکا بەسەر یەکاودەبێتە پووشوپار ﴿إن فی ذلك لذکری لأولی الألباب﴾ بەڕاستیی لەوەدا یادخستنەوەهەیە بۆ ژیروخاوەن ئاوەزەکان ،دەتوانن خوای پیٚ بدۆزنەوەو بڕوای بتەو بەزیندوو بوونەوەش بێنن ﴿[22] افمن شرح الله صدره للإسلام﴾ ئایا کەسێك خوا دڵی بۆ ئیسلام گوشادو ئاواڵە کردبیٚ و جێگەی ئیسلامیی تێدا کردبێتەوە ﴿فهو علی نور من ربه﴾ ئەوە ئەوکەسە لە سەر رووناکیەکە لە پەروەردگاریەوە و، ڕێنوێنە، جائایا کەسێکی ئاوا، وەکو ئەوکەسە وایە کەلەیادکردنی خوا دڵی ڕەق بووبیٚ؟ دیارە نەخێر ﴿فویل للقاسیة قلوبهم من ذکر الله﴾ جا تیاچوون بۆ دڵرەقان، لەیادکردنی خوا ﴿اولئك فی ضلال مبین﴾ ئا ئەوانە لەگومراییەکی ئاشکرادان.

**قورئان چاکترین قسەیە:**

﴿[23] الله نزل احسن الحدیث﴾ خوا چاکترین قسەو فەرموودەی ناردووە، ئەویش ئەم قورئانەیە بۆ ئەوەی پەیڕەوی لیٚبکریٚ ﴿کتاباً متشابها﴾ کتێبێکی وێکچووە،واتە: لەرووی قەشەنگیی و پرشنگداریی ورەوانبێژییەوە هەموو لەیەك دەچیٚ ﴿مثانی﴾ پەندو ئامۆژگاری وفەرمان بەحەڵاڵ وڕێگری لە حەرام وداستان وچیرۆکەکانی دووپات بووەوەیە چەند جارو بار ﴿تقشعر منه جلود الذین یخشون ربهم﴾ لە بیستنی هەڕەشەکانیدا،ئەوانەی کە لەپەروەردگاریان پێستیان گرژدەبیٚ ﴿ثم تلین جلودهم وقلوبهم إلی ذکر الله﴾ لەپاشان دڵ و پێستیان، بۆیادی بەزەیی خوا نەرم وساکن دەبیٚ و ئۆقرەدەگریٚ، ئەوەیە خووڕەوشتی صاڵحان لەبەرانبەر قورئانەوە، وەك دەفەرمووێ: (خروا سجدا وبکیا)١٩/٥٨. یان دەفەرمویٚ: (والذین إذا ذکروا بآیات ربهم لم یخروا علیها صما وعمیانا)(٢٥/٧٣). هەرگیز بە کەڕوکوێری بەسەر قورئانا تێناپەڕن.﴿ذلك هدی الله یهدی به من یشاء﴾ ئەو قورئانەیە ڕێنومایی خوا، هەرکەسێك خوا خۆیبیەویٚ پێی شارەزاو ڕێنموونی ئەکات ﴿ومن یضلل الله فما له من هاد﴾ هەرکەسێکیش خوا گومڕای بکا- بەهۆی لاساریی خۆیەوە- کەسیٚ تر نیە ڕێنموونی بکات.

سُورَةُ الزُّمَرِ — الجزء الثالث والعشرون

أَفَمَن شَرَحَ ٱللَّهُ صَدْرَهُۥ لِلْإِسْلَٰمِ فَهُوَ عَلَىٰ نُورٍ مِّن رَّبِّهِۦ ۚ فَوَيْلٌ
لِّلْقَٰسِيَةِ قُلُوبُهُم مِّن ذِكْرِ ٱللَّهِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٢٢﴾
ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ ٱلْحَدِيثِ كِتَٰبًا مُّتَشَٰبِهًا مَّثَانِىَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ
جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ
إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهْدِى بِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ وَمَن
يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴿٢٣﴾ أَفَمَن يَتَّقِى بِوَجْهِهِۦ سُوٓءَ
ٱلْعَذَابِ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ وَقِيلَ لِلظَّٰلِمِينَ ذُوقُوا۟ مَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ
﴿٢٤﴾ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَأَتَىٰهُمُ ٱلْعَذَابُ مِنْ حَيْثُ
لَا يَشْعُرُونَ ﴿٢٥﴾ فَأَذَاقَهُمُ ٱللَّهُ ٱلْخِزْىَ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَعَذَابُ
ٱلْءَاخِرَةِ أَكْبَرُ ۚ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿٢٦﴾ وَلَقَدْ ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ فِى
هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ مِن كُلِّ مَثَلٍ لَّعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٧﴾ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا
غَيْرَ ذِى عِوَجٍ لَّعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿٢٨﴾ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا رَّجُلًا فِيهِ
شُرَكَآءُ مُتَشَٰكِسُونَ وَرَجُلًا سَلَمًا لِّرَجُلٍ هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلًا ۚ
ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٩﴾ إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ
﴿٣٠﴾ ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ عِندَ رَبِّكُمْ تَخْتَصِمُونَ ﴿٣١﴾

٤٦١

## پاشه ڕۆژی مرۆڤی لەخوا ترس و درۆزن:

﴿[٢٤] افمن يتقى بوجهه سوء العذاب يوم القيامة﴾ ئاخۆ کەسێك بە روخساریی خۆی لە سزای بەدی ڕۆژی قیامەت بپارێزێ، واتە: کۆت وزنجیر کرابێ ولەناو سزادا بێ، هەوڵبدابەدەم وچاوی ،خۆی رزگار بکات، ئایا ئەوکەسە وەکو بەهەشتیەك وایە کەهەرگیز ئاگری دۆزەخی پێنەگاو لە شوێنێکی ئاسایشدا بێ؟، وەك بۆ نموونەئەفەرمووێ: (افمن يمشى مكبا على وجهه أهدى أمن يمشى سويا على صراط مستقيم)٢٢/٦٢. وەیان ئەفەرموێ (افمن يلقى فى النار خير أم من يأتى آمنا يوم القيامة..)٤٠/٤١. ﴿وقيل للظالمين ذوقوا ما كنتم تكسبون﴾ بە ستەمکارەکان ئەوترێ: دەبچێژن بەرهەمی سزای کردەوەی خۆتان ﴿[٢٥] كذب الذين من قبلهم﴾ خەڵکانی پێش ئەمانیش پێغەمبەرەکان و ئایەتەکانی ئێمەیان بەدرۆدانا ﴿فأتاهم العذاب من حيث لا يشعرون﴾ ئینجا لەلایەکەوە سزایان بۆ هات کەهەر بەخۆشیان نەزانی ﴿[٢٦] فأذاقهم الله الخزى فىالحياة الدنيا﴾ جا خوا سووکایەتی لە ژیانی ئەم دونیایەدا پێچەشتن ﴿ولعذاب الآخرة اكبر﴾ دیارە سزای پاشەرۆژیش گەورەترە ﴿لو كانوا يعلمون﴾ ئەگەرئەیانزانی.

## دوو نەزیلە بۆ شیرك:

﴿[٢٧] ولقد ضربنا للناس فى هذا القرآن من كل مثل﴾ بێگومان ئێمە لەم قورئانەدا لە هەموو نموونەیەکمان هێنایەوە بۆ ئەم خەڵکە لەهەواڵی گەلانی رابردوو سەرپێچیان وئەنجامیان ﴿لعلهم يتذكرون﴾ بەشکو پەندو ئامۆژگاری وەربگرن ﴿[٢٨] قرآنا عربيا غير ذى عوج﴾ ئەو قورئانەش قورئانێکی رەوانبێژو دوور لەهەر ناڕێکیی و چەوتییەکەو، بەزمانی عەرەبیشەو، بەهیچ شێوەیەکیش دژایەتیو کەم وکورتی لەنێوان ئایەتەکانیدا نیە ﴿لعلهم يتقون﴾ بەشکو لەخوا تەقواو پارێز بکەن ﴿[٢٩] ضرب الله مثلا رجلا فيه شركاء متشاكسون﴾ خوا نموونەیەکی هێناوەتەوە بە پیاوێك بەندەی چەند کەسێك بێو، هەریەکەشیان کارێکی پێ بسپێرێ: ئەم پێیبڵێ برۆ، ئەویکەیان بڵێ مەڕۆ.﴿ورجلا سلما لرجل﴾ نمونەیەکیشی هێناوەتەوە بەپیاوێکیتر، بەندەی تاقە کەسێك بێ، هەرئەو کەسە سەرپەرشتی بکات ﴿هل يستويان مثلا﴾ ئاخۆ ئەودووانە لەخۆشحاڵیی و دڵخۆشیی و بەر چاو روونیدا یەکسانن؟ دیارە یەکسان نین، جا مرۆڤێکی یەکتاپەرستیش لەگەڵ موشریکێکدا کە چەند بتێك بپەرستێ ئاوایە، موسڵمانەکە لەیەك لاوە بڕیاری بۆدەردەچێت و، دڵیشی زۆرئاسوودەیە، بەڵام موشریکەکە لە لاوە ئاراستە دەکرێو سەرەنجام سەری لێ تێکدەچێ!! ﴿الحمد لله﴾ سوپاس هەربۆ خوایە، لەسەر راست کردنەوەی بەڵگە لەسەر خەڵك ﴿بل اكثرهم لا يعلمون﴾ بەڵام زۆرترینیان ڕاستییە نازانن.

## گشت دەمرین:

﴿[٣٠] إنك ميت و إنهم ميتون﴾ بەراستیی ئەی موحەممەد ﷺ ئەمریی و، ئەوانیش هەرئەمرن، واتە: لەداهاتوودا هەمووتان ئەمرن، جا ئەوکاتە خوا دادگایی ئەکات و هەق و ناهەق دەرئەکەوێ ﴿[٣١] ثم إنكم يوم القيامة عند ربكم تختصمون﴾ پاشان ئێوە لە ڕۆژی قیامەتیشدا لەلای پەروەردگارتاندا دەمەقاڵێ و کێشمەکێش دەکەن.

کۆتایی جزمی بیست و سێ یەم

و لله الحمد و المنة.

*** *** ***

### کیٚ له هه‌موو که‌س سته‌مکارتره:

﴿[٣٢] فمن اظلم ممن كذب على الله﴾ جا چ که‌سێك له‌وه سته‌مکارتره که درۆ له سه‌ر خوا هه‌ڵبه‌سیٚ وبڵیٚ خوا شه‌ریك و هاوه‌ڵی هه‌یه، یان بڵێت منداڵی هه‌یه؟؟ ﴿وكذب بالصدق إذجاءه﴾ ئه‌و قسه ڕاسته‌ش (واته: قورئان) کاتیٚ له‌سه‌ر زمانی پێغه‌مبه‌ر ﷺ بۆی هات، به‌درۆ بزانێت؟! دیاره که له‌وه سته‌مکارتر نییه، چونکه هه‌م له سه‌رخوا درۆی هه‌ڵبه‌ستووه، هه‌م باوه‌ڕیشی به‌پێغه‌مبه‌ر ﷺ نه‌کردووه! ﴿اليس فى جهنم مثوى للكافرين﴾ ئایا بۆ بیٚ باوه‌ڕان له جه‌حه‌ننه‌مدا جێگه نییه؟ واته: ئه‌وانه که‌نکووڵی ڕاستییه‌کان ده‌که‌ن ئه‌هلی جه‌حه‌ننه‌من. ﴿[٣٣] والذى جاء بالصدق﴾ ئه‌و که‌سه‌ی به فه‌رمووده ڕاسته‌که‌وه هات (قورئان) که‌پێغه‌مبه‌ر خۆیه‌تی ﴿وصدق به﴾ له هه‌مانکاتیشدا ددانی پێیادانا ﴿اولئك هم المتقون﴾ هه‌ر ئه‌وانه‌ن خوا ترس و پارێزکارو سنووره‌کانی خوا نابه‌زێنن وله‌شیرك دووره‌گرن ﴿[٣٤] لهم ما يشاؤن عند ربهم﴾ بۆیان هه‌یه هه‌ر شتێك ئاره‌زوو بکه‌ن -له‌به هه‌شتدا- لای په‌روه‌ردگاریان ﴿ذلك جزاء المحسنين﴾ ئه‌وه‌ش پاداشتی چاککاره‌کانه ﴿[٣٥] ليكفر الله عنهم اسوا الذى عملوا﴾ تا خراپترین کاریٚ -پێش موسڵمان بوونیان ئه‌نجامیان داوه- خوا بیپۆشیٚ و قه‌ڵه‌می لێبوردنی به سه‌را بێنێت ﴿ويجزيهم اجرهم باحسن الذي كانوا يعملون﴾ وه‌به چاکتر له‌وه‌ی کردوویانه پاداشتیان بداتیٚ.



۞ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَذَبَ عَلَى ٱللَّهِ وَكَذَّبَ بِٱلصِّدْقِ
إِذْ جَآءَهُۥٓ ۚ أَلَيْسَ فِى جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْكَٰفِرِينَ ﴿٣٢﴾ وَٱلَّذِى
جَآءَ بِٱلصِّدْقِ وَصَدَّقَ بِهِۦٓ ۙ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ﴿٣٣﴾
لَهُم مَّا يَشَآءُونَ عِندَ رَبِّهِمْ ۚ ذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٣٤﴾
لِيُكَفِّرَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ أَسْوَأَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ وَيَجْزِيَهُمْ أَجْرَهُم
بِأَحْسَنِ ٱلَّذِى كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٣٥﴾ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِكَافٍ
عَبْدَهُۥ ۖ وَيُخَوِّفُونَكَ بِٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦ ۚ وَمَن يُضْلِلِ
ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴿٣٦﴾ وَمَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّضِلٍّ ۗ
أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِعَزِيزٍ ذِى ٱنتِقَامٍ ﴿٣٧﴾ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ۚ قُلْ أَفَرَءَيْتُم مَّا تَدْعُونَ
مِن دُونِ ٱللَّهِ إِنْ أَرَادَنِىَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ هَلْ هُنَّ كَٰشِفَٰتُ ضُرِّهِۦٓ
أَوْ أَرَادَنِى بِرَحْمَةٍ هَلْ هُنَّ مُمْسِكَٰتُ رَحْمَتِهِۦ ۚ قُلْ حَسْبِىَ
ٱللَّهُ ۖ عَلَيْهِ يَتَوَكَّلُ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ ﴿٣٨﴾ قُلْ يَٰقَوْمِ ٱعْمَلُوا۟
عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنِّى عَٰمِلٌ ۖ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٣٩﴾
مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ وَيَحِلُّ عَلَيْهِ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ﴿٤٠﴾



### ته‌نیا خوا به‌سه بۆ به‌نده‌ی خۆی:

﴿[٣٦] اليس الله بكاف عبده﴾ ئایا ئه‌ی پێغه‌مبه‌ر! هه‌ر خوا به‌س نیه بۆ به‌نده‌ی خۆی(موحه‌ممه‌د) له کاتی هه‌موو خۆشی و ناخۆشییه‌کدا؟ ﴿ويخوفونك بالذين من دونه﴾ و هاوبه‌شدانه‌ران به جگه له خوا (به‌بته‌کان) ده‌تترسێنن! واته:له‌باتی ئه‌وه‌که ته‌نها به‌خوا بترسێنن، که‌چی له‌به‌رگومڕایی خۆیان به‌بته‌کان هه‌ڕه‌شه‌ت لێده‌که‌ن و ده‌تترسێنن ﴿ومن يضلل الله فما له من هاد﴾ دیاره ئه‌وانه سه‌رلێشێواون، خۆهه‌رکه‌سیش خوا سه‌رلێشێواوو گومڕای بکات ,به‌هۆی چه‌وتی خۆیه‌وه, هیچ که‌سێك نییه بتوانیٚ ڕینمایی بکاو بهێنێته‌وه سه‌ر ڕێگای ڕاست ﴿[٣٧] ومن يهد الله فما له من مضل﴾ و هه‌رکه‌سێکیش خوا ڕێنمایی بکات، هیچ که‌سێك نییه سه‌ر لێشێواوو کلای بکات ﴿اليس الله بعزيز ذى انتقام﴾ ئایا خوا ده‌سه‌ڵاتداری خاوه‌ن تۆڵه نیه له‌موشریکان؟ به‌ڵیٚ خوا ده‌سه‌ڵاتداری خاوه‌ن تۆڵه‌یه.

### موشریکانیش ده‌زانن ئاسمان و زه‌مین خوا به دیهێناون:

﴿[٣٨] ولئن سألتهم من خلق السموات والارض﴾ خۆ ئه‌گه‌ر لێیان بپرسی کیٚ ئاسمانه‌کان وزه‌وی دروستکرد؟ ﴿ليقولن الله﴾ به‌ته‌ئکید له‌وه‌ڵامدا ئه‌ڵێن: هه‌رخوا دروستیی کردوون، که‌چی له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا هاوبه‌شیشی

بۆدادەنێن﴿قل ارايتم ما تدعون من دون الله﴾ ئەی موحەممەد! بڵێ: ئا پێمان بڵێن ئەو بتانە کەلەباتی خوا ئەیانپەرستن، بەتایبەت دوای ئەوەکە دەسەڵات و توانای خواتان بۆ دەرکەوت، پێمان بڵێن دەسەڵاتیان چۆن دەبینن؟﴿إن ارادنی الله بضر هل هن كاشفات ضره﴾ ئەگەرخوا ویستی دووچاری بەڵاو ناڕەحەتیەکم بکات، ئایا ئەوبتانە ئەتوانن ئەوبەڵامە لەسەر لاببەن؟ ﴿او ارادنی رحمة هل هن ممسكات رحمته﴾ یان ئەگەرخوا ویستی سوودێکم پێبگەیەنێت , ئایا ئەوبتانە ئەتوانن رایگرن و نەهێڵن بمگاتێ؟! ﴿قل حسبی الله﴾ دەسا بڵێ: من بۆ هەمووشتێك تەنها خوام بەسە، چونکە زیان و قازانج هەر بەدەست ئەوە﴿عليه يتوكل المتوكلون﴾ هەر بە ئەو پشت ئەستوورن ,باوەڕدارانی پشت ئەستوور، نەك بە ئەمو ئەوو بە بتەکان ﴿قل يا قوم اعملوا على مكانتكم﴾ ئەی موحەممەدﷺ بڵێ ئەی هۆزەکەم! دەسا ئێوە لەسەر حاڵەتی خۆتان کار بکەن , واتە:هەرچی فڕوفێڵ و تەڵەکەو پیلانتان لەدەست دێ دژی من ئەنجامی بدەن ﴿انی عامل﴾ وامنیش لە سەر حاڵەتی خۆم کار دەکەم و لەهەوڵدادەبم ﴿فسوف تعلمون﴾ جا بەم زووانە چاك ئەزانن! ﴿[٤٠] من يأتيه عذاب يخزيه﴾ کێ لەدنیادا سزایەکیبۆ بێ ئابڕووی بەرێ ﴿ويحل عليه عذاب مقيم﴾ و جەزرەبەو سزایەکی هەمیشەیی دادەبارێتە سەری؟ ﴿[٤١] انا انزلنا عليك الكتاب للناس بالحق﴾ بەڕاستیی ئێمە ئەم قورئانەمان بەرێك وپێکی و راست و دروست دابەزاندە سەر تۆ , رایبگەیەنیت بە ئادەمی وبە پەری ﴿فمن اهتدى فلنفسه﴾ ئینجا هەرئەوی شارەزا و رێنما بوو، ئەوە بەقازانجی خۆیەتی ﴿ومن ضل فإنما يضل عليها﴾ و هەرکەسیش گومڕاو سەرلێشێواو بوو و گوێی بە فەرمانی خوا نەدا، ئەوە بۆ خۆی گومڕا دەبێ و تەنها بەخۆیشی زیان دەگات ﴿وما انت عليهم بوكيل﴾ خۆ تۆش کار پێ سپێراوو بریکاری ئەوان نیت، هەتا هیدایەتی ئەوانت لە ئەستۆ بێت، وەك لەجێگای تردا جەخت لە سەرئەو راستیە دەکاتەوەو دەفەرموێ: (انما انت نذير)، ١٢/١١ یان دەفەرموێ: (فإنما عليك البلاغ و علينا الحساب)، ١٤/١٣.



إِنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ لِلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ ۖ فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ
فَلِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا ۖ وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم
بِوَكِيلٍ ﴿٤١﴾ ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَٱلَّتِى
لَمْ تَمُتْ فِى مَنَامِهَا ۖ فَيُمْسِكُ ٱلَّتِى قَضَىٰ عَلَيْهَا ٱلْمَوْتَ
وَيُرْسِلُ ٱلْأُخْرَىٰٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ
لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٢﴾ أَمِ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ شُفَعَآءَ ۚ
قُلْ أَوَلَوْ كَانُوا۟ لَا يَمْلِكُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَعْقِلُونَ ﴿٤٣﴾
قُل لِّلَّهِ ٱلشَّفَٰعَةُ جَمِيعًا ۖ لَّهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ ثُمَّ
إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٤٤﴾ وَإِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَحْدَهُ ٱشْمَأَزَّتْ
قُلُوبُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَإِذَا ذُكِرَ ٱلَّذِينَ مِن
دُونِهِۦٓ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿٤٥﴾ قُلِ ٱللَّهُمَّ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلْأَرْضِ عَٰلِمَ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ أَنتَ تَحْكُمُ بَيْنَ عِبَادِكَ
فِى مَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿٤٦﴾ وَلَوْ أَنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟
مَا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُۥ مَعَهُۥ لَٱفْتَدَوْا۟ بِهِۦ مِن سُوٓءِ ٱلْعَذَابِ
يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ وَبَدَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مَا لَمْ يَكُونُوا۟ يَحْتَسِبُونَ ﴿٤٧﴾



### ژین و مەرگ هەر بە دەستی خوایە:

﴿[٤٢] الله يتوفى الانفس حين موتها﴾ هەر خوایە کە گیانەکانی خەڵکی دەکێشێ لە کاتی مردنی خاوەنەکانیاندا ﴿والتی لم تمت فی منامها﴾ و ئەوگیانانەش کە خاوەنەکانیان نەمردوون و لەخەودان, هەر بۆخۆی گیانیان دەکێشێ ﴿فيمسك التی قضى عليها الموت﴾ ئینجا ئەو گیانانە رادەگرێ بڕیاری مەرگی خاوەنەکانیانی داو, ئیدی ناگەڕێتەوە لاشەکانیان ﴿ويرسل الأخرى إلى اجل مسمى﴾ گیانەکانی دیکەش بەرەڵا دەکاو نایانمرێنێ تا کاتێکی دیاریکراودەژین ﴿إن فی ذلك لآيات لقوم يتفكرون﴾ بە راستی لەوەدا بەڵگە و نیشانەی بەهێز هەیە بۆ خەڵکێك

تێفکرێ و بیر لـه دەسەڵات و توانای خوابکاتـەوە. جائایـا(رۆح)و (نـەفس) هـەردووکیان یـەك شتن؟ یـان (روح) لـه (نەفس)جیایە؟لەوە دەچێت بەپێی ئەم فەرموودانە هەردووکیان یەکشتبن:

١- ئیمامی(موسلیم) ئەم فەرموودەیە دێنی: ((إن الروح إذا قبض تبعه البصر)).

٢- ((فذلك حين يتبع بصره نفسه))/موسلیم. وەلە فەرموودەدا هەیە کە مرۆڤ کاتێ ویستی بخەوێ ,سوننەتە ئەم دوعایە بخوێنێ: (سبحانك ربى وضعت جنبى، وبك أرفعه إن أمسكت نفسى فاغفر لها)/متفق عليه. (فتح البارى: ١١/١٣٠،مسلم: ٤/٢٠٨٤).

**تکاکاری هەر بۆ خوایە:**

﴿[٤٣] ام اتخذوا من دون الله شفعاء﴾ ئاخۆ راستە جگە لەخوا بتەکانیان کردوٚتە تکاکار, شەفاعەتیان بۆبکەن لای خودا؟!﴿قل اولوكانوا لايملكون شيئا ولايعقلون﴾ پێیان بڵێ ئەی پێغەمبەر!: ئایا ئەگەر ئەوانە هیچیشیان بەدەست نەبێ و لەهیچیش تێنەگەن، هەر دەیانپەرستن و دەیانکەنە تکاکار بۆخۆیان؟!﴿[٤٤] قل لله الشفاعة جميعا﴾ بڵێ: لێبوردن و بەخشین و تکاو شەفاعەت سەرلەبەر تەنها بۆخوایە ,هیچ کەسیکی دیکە شتێکی بە دەست نیە ﴿له ملك السموات والأرض﴾ خاوەنێتی ئاسمانەکان و زەوی هەر بۆ ئەوە ﴿ثم إليه ترجعون﴾ پاشانیش هەموو هەر بۆ لای ئەو دەگێردرێنەوەو دادگایی دەکرێن.

**بێزاری بتپەرستەکان بەناو هێنانی (الله) بە تەنیا:**

﴿[٤٥] وإذا ذكر الله وحده﴾ کاتێ ناوی خوا ,بەبێ ناو هێنانی بتەکان) ببرێ ﴿اشمأزت قلوب الذين لا يؤمنون بالآخرة﴾ دڵی ئەوانە کە بروایان بە رۆژی دوایی نیە دێتەوەیەك و، پڕدەبێ لەرق و کینە! وەك ئەم ئایەتەش هەمان مەبەست رادەگەیەنی: (إنهم كانوا إذا قيل لهم لاإله إلا الله يستكبرون) ٣٥/٣٧ ﴿وإذا ذكر الذين من دونه إذا هم يستبشرون﴾ خۆئەگەر لەباتی خوا ناوی پەرستراوەکانیان ببرێ , ئەگەرچی لەرێی دەست تیوەردانی شەیتانیشەوە بێ , لەناکاو موژدە بەخش و خۆشحاڵ دەبن و گەشەی پێدەکەن!.

**رێگای دۆعاو پاڕانەوە:**

﴿[٤٦] قل اللهم فاطر السموات والأرض﴾ بڵێ: ئەی خوایە! ئەی بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەویی! ﴿عالم الغيب والشهادة﴾ زانای پەنهان و ئاشکرا، زانای دیارو نادیار!﴿انت تحكم بين عبادك فيما كانوا فيه يختلفون﴾ هەر ئەتۆ لە نێوان بەندەکانی خۆتا داوەریی دەکەیت، لەو شتانەدا وا کێشەو جیاوازییان تیاهەیە،هەر ئەتۆ بڕیاری تێروتەسەڵ ئەدەیت، هەق و ناهەق جیا دەکەیتەوە. ﴿[٤٧] ولو ان للذين ظلموا ما في الأرض جميعا ومثله معه﴾ ئەگەر بەراستی هەرچی لەم زەویەدایە و، ئەوەندەی تریشی لەگەڵدا بێت، هی ستەمکاران وکافران بێ ﴿لافتدوا به من سوء العذاب يوم القيامة﴾ لە بەرسزای توندی قیامەت ئامادەن بیکە نە بارتەقاو فیدیەی خۆیان، تا رزگار بن ﴿[٤٨] وبدا لهم من الله مالم يكونوا يحتسبون﴾ وهێمان لە خوا، هەندێ شتی تریان بۆدەرئەکەوێ کە هیچ حسابێکیان بۆ ئەوشتە نەکردووە بێتە رێیان ﴿وبدا لهم سيئات ما كسبوا﴾ وەناهەموارە ئەو کارە خراپانەلە دنیادا ئەنجامیان دەدان بۆیان ئاشکرا دەبێ ﴿وحاق بهم ماكانوا به يستهزئون﴾ وە ئەو سزایەی گاڵتەیان پێئەکرد، دەوریان دەدا. چونکە کە قورئان باسی سزای دوارۆژی بۆ ئەکردن، ئەوان گاڵتەیان پێئەکرد، جاوا ئێستا ئەمڕۆ لەهەموولایەکەوە سزا دەبارێتە سەریان.

## بڕیاری مرۆڤی بێ باوەڕ:

﴿٤٩ فإذا مس الإنسان ضر دعانا﴾ جاهەر کە مرۆڤی بێباوەڕ تووشی زیان وناخۆشییەك دێ! دەبینی بەپەلە هاوارمان بۆ دێنێ و دەست ئەکات بە لاڵەو پاڕانەوە لێمان ﴿ثم إذا خولناه نعمة منا﴾ پاشان ئەگەر لە لایەن خۆمانەوە بەهرەیەکمان پێدا ﴿قال إنما اوتیته علی علم﴾ قسەی پێشووی خۆی لە بیر ئەچێتەوەو ئەڵێ: بەڕاستی ئەم بەهرەیەم هەر بە هۆی ژیریی و زانایی خۆمەوە دەستکەوتووە ﴿بل هی فتنة﴾ نەخێر، وا نیە وەك ئەوان دەڵێن بەڵکو ئەو بەهرەو نیعمەتە تەنیا تاقی کردنەوەیە بۆی ﴿ولکن اکثرهم لایعلمون﴾ بەلام زۆربەیان نازانن, کە ئەو هەموو دارایی و دەسەڵاتە تاقی کردنەوەیە بۆیان" ﴿٥٠ قد قالها الذین من قبلهم﴾ بە راستی ئەو بێ بڕوایانەیش لە پێش قورەیشەوە بوون, هەر ئەو قسەیانەیان دە کرد ودەیانوت: ئەو سامانە بە کردو کۆششی خۆمان پەیدامان کردووە، نەك خوا پێی دابین! ﴿فما اغنی عنهم ما کانوا یکسبون﴾ جا کاتێکیش سزا هاتە سەریان ئەوەی بە دەستیان هێنا بوو- لەماڵ وسامان- هیچ سودێکی پێنەگەیاندن ﴿٥١ فاصابهم سیئات ما کسبوا﴾ جا تۆڵەی بەدکاری خۆیانیان تووش بوو ﴿والذین ظلموا من هؤلاء سیصیبهم سیئات ماکسبوا﴾، ئەوانەش ستەمیان کرد- واتە:بتپەرستەکانی مەککە- تووشیان دەبێ تۆڵەو ناسوریەکانی ئەو کردەوانەی کردبوونیان, ئەوەبوو حەوت ساڵ تووشی قات و قڕی بوون و زۆربەی سەر زلەکانیان لەرۆژی (بەدر)ا کوژران ﴿وماهم بمعجزین﴾ ولەهەمان کاتیشدا دەستەوسانمان ناکەن , ناتوانن لەدەستمان دەرچن و خۆ رزگاربکەن ﴿٥٢ او لم یعلموا ان الله یبسط الرزق لمن یشاء ویقدر﴾ پێیان وابوو ئەو دەسەڵات وماڵ ودارابییە لەزانایی خۆیانە، ئەی ئایا نەیانزانیوە کەهەر خوایە رزق وڕۆزی دەدات، بۆهەندێ زۆر، بۆهەندێ کەم ﴿إن فی ذلك لآیات لقوم یؤمنون﴾ بە راستیی لەوەدا گەلێ نیشانەو بەڵگە هەیە بۆ هۆزێ بیەوێ بڕوابێنێ.

الجزء الرابع والعشرون — سورة الزمر

وَبَدَا لَهُمْ سَيِّـَٔاتُ مَا كَسَبُوا۟ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٤٨﴾ فَإِذَا مَسَّ ٱلْإِنسَـٰنَ ضُرٌّ دَعَانَا ثُمَّ إِذَا خَوَّلْنَـٰهُ نِعْمَةً مِّنَّا قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلْمٍۭ ۚ بَلْ هِىَ فِتْنَةٌ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٤٩﴾ قَدْ قَالَهَا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَمَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٥٠﴾ فَأَصَابَهُمْ سَيِّـَٔاتُ مَا كَسَبُوا۟ ۚ وَٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مِنْ هَـٰٓؤُلَآءِ سَيُصِيبُهُمْ سَيِّـَٔاتُ مَا كَسَبُوا۟ وَمَا هُم بِمُعْجِزِينَ ﴿٥١﴾ أَوَلَمْ يَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٢﴾ ۞ قُلْ يَـٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ وَأَنِيبُوٓا۟ إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا۟ لَهُۥ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلْعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴿٥٤﴾ وَٱتَّبِعُوٓا۟ أَحْسَنَ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلْعَذَابُ بَغْتَةً وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ ﴿٥٥﴾ أَن تَقُولَ نَفْسٌ يَـٰحَسْرَتَىٰ عَلَىٰ مَا فَرَّطتُ فِى جَنۢبِ ٱللَّهِ وَإِن كُنتُ لَمِنَ ٱلسَّـٰخِرِينَ ﴿٥٦﴾

حزب ٤٧

٤٦٤ أَن تَقُولَ

## بانگەواز بۆ تەوبە, پێش هاتنی سزا:

﴿٥٣ قل یا عبادی الذین أسرفوا علی انفسهم﴾ ئەی موحەممەد! ﷺ لە منەوە بڵێ: ئەی بەندەکانی من! ئەی ئەوانەی ستەم و زیادە رۆییتان لە خۆتان کردووە! ﴿لا تقنطوا من رحمة الله﴾ ئێوە لەرەحمەت و میهرەبانی خوا بێ ئومێد مەبن، (ئیبن عەباس) دەڵێ: بڕێ لە موشریك و هاوبەشدانەرەکان ,خەڵکێکی زۆریان کوشتبوو، زینایان کردبوو، پاشان هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ وتیان: ئەو قسەو باسە تۆ دەیڵێی شتێکیزۆر چاکە،ئەی خۆزگە کەفارەتی گوناحەکانمانت پێ دەوتین: ئەو جا ئایەتی (والذین لایدعون مع الله إلها آخر ولا یقتلون النفس التی حرم الله إلا بالحق ولا یزنون) ٢٥ /٦٨، وە ئایەتی (قل یاعبادی الذین أسرفوا علی انفسهم لا تقنطوا من رحمة الله..)،

هات. ٥٣/٣٩، متفق علیه/ (فتح الباری: ٤١١/١٨ مسلم: ١١٣/١) ﴿إن الله یغفر الذنوب جمیعا﴾ بەڕاستیی خوا لە
هەموو گوناحێ خۆش ئەبێ دیارە ئەم بانگەشەیە بۆ تەواوی تاوانبارانە کە بگەڕێنەوە بۆلای خوا، ئەگەرچی گونا
هیشیان بەئەندازەی کەفی سەر زەریاکان بێ، (ئەنەس) ئەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((والذی نفسي بیده لو
أخطأتم حتى تملأ خطایاکم مابین السماء و الارض ثم استغفرتم الله لغفر لکم، و الذی نفس محمد بیده لو لم تخطئوا
لجاءالله بقوم یخطئون ثم یستغفرون الله فیغفر لهم/مسند الامام احمد٢٣٨/٣. ﴿إنه هو الغفور الرحیم﴾ چونکە ئەوە
لێبوردەو میهرەبان ﴿٥٤ وانیبوا إلى ربکم واسلموا له﴾ بگەڕێنەوەو بۆلای خواوە ندتان و ملکەچی فەرمانی ئەوبن
﴿من قبل ان یأتیکم العذاب﴾ پێش ئەوە سزاکەتان بۆ بێ ﴿ثم لا تنصرون﴾ دواییش ئیتر لەلایەن هیچ کەسێکەوە
یارمەتی نادرێن ﴿٥٥ واتبعوا أحسن ما انزل إلیکم من ربکم﴾


أَوۡ تَقُولَ لَوۡ أَنَّ ٱللَّهَ هَدَىٰنِي لَكُنتُ مِنَ ٱلۡمُتَّقِينَ ٥٧
أَوۡ تَقُولَ حِينَ تَرَى ٱلۡعَذَابَ لَوۡ أَنَّ لِي كَرَّةٗ فَأَكُونَ
مِنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٥٨ بَلَىٰ قَدۡ جَآءَتۡكَ ءَايَٰتِي فَكَذَّبۡتَ بِهَا
وَٱسۡتَكۡبَرۡتَ وَكُنتَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٥٩ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ
تَرَى ٱلَّذِينَ كَذَبُواْ عَلَى ٱللَّهِ وُجُوهُهُم مُّسۡوَدَّةٌۚ أَلَيۡسَ فِي
جَهَنَّمَ مَثۡوٗى لِّلۡمُتَكَبِّرِينَ ٦٠ وَيُنَجِّي ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ
بِمَفَازَتِهِمۡ لَا يَمَسُّهُمُ ٱلسُّوٓءُ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ٦١ ٱللَّهُ
خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ وَكِيلٞ ٦٢ لَّهُۥ مَقَالِيدُ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ
هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ٦٣ قُلۡ أَفَغَيۡرَ ٱللَّهِ تَأۡمُرُوٓنِّيٓ أَعۡبُدُ أَيُّهَا
ٱلۡجَٰهِلُونَ ٦٤ وَلَقَدۡ أُوحِيَ إِلَيۡكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكَ لَئِنۡ
أَشۡرَكۡتَ لَيَحۡبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ٦٥ بَلِ ٱللَّهَ
فَٱعۡبُدۡ وَكُن مِّنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ٦٦ وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦ
وَٱلۡأَرۡضُ جَمِيعٗا قَبۡضَتُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ
مَطۡوِيَّٰتُۢ بِيَمِينِهِۦۚ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ٦٧


لە باشترین نامە کە پەروەردگارتان دایبەزاندووە بۆتان،
پەیڕەوی بکەن، واتە: پەیرەوی لە قورئان بکەن.

**ڕوونکردنەوە:** لە قورئاندا (حسن) و(أحسن) هەیە، بۆ
نمونە پەیڕەوی لە روخسەت (حسن)ـە، لە عەزیمەت
(أحسن)ـە، وە لە (قصاص) (حسن)ـە، وە لە عەفوو
(أحسن)ـە. ﴿من قبل ان یأتیکم العذاب بغتة﴾ پێش ئەوەی
کتوپڕ سزاکەتان بۆبێت ﴿وانتم لا تشعرون﴾ هەستیش بە
خۆتان نەکەن، تاشتێ بکەن بۆ خۆتان ﴿٥٦ ان تقول نفس یا
حسرتی علی مافرطت فی جنب الله﴾ نەوەك کەسێ بڵێ:
ئەی داخ لەسەر کەمتەرخمیم لەلای خواو لە گوێڕایەڵی خوا
﴿و إن کنت لمن الساخرین﴾ بێ شك لە گاڵتەکەرانیش بووم
بە ئایینی خواو کتێبی خوا، واتە: جگە لە سەرپێچیم
گاڵتەیشم بەموسڵمانان ئەکرد ﴿٥٧ او تقول لو ان الله هدانی
لکنت من المتقین﴾ یان بڵێ: ئەگەر خوا ڕێنموونی
بکردمایە، لەپارێزکاران ئەبووم ﴿٥٨ او تقول حین تری
العذاب﴾ یان کاتێ سزای خوا دەبینێ بڵێ: ﴿لو ان لی کرة
فأکون من المحسنین﴾ بریا جارێکی تردەگەڕامەوە بۆ دونیا و لەگەڵ چاککاران ئەبووم ﴿٥٩ بلی قد جاءتك آیاتی
فکذبت بها﴾ خوا ئەفەرموێ: بەڵێ.. خۆ گەلێ ئایەت و نیشانەکانی منت بۆ هات، جابەدرۆت زانی و بڕوایشت
نەهێنا ﴿واستکبرت وکنت من الکافرین﴾ بایی بوویت و، بوویتە کافروبێ باوەڕ.

دوا رۆژی درۆزنان و پارێزکاران:

﴿٦٠ و یوم القیامة تری الذین کذبواعلی الله﴾ لەرۆژی قیامەتیشدا ئەوکەسانە درۆیان لەسەر خوا هەڵبەستووە،
گوتیان: خودا منداڵ و شەریکی هەیە) دەبینی ﴿وجوههم مسودة﴾ ڕوویان رەشداگەڕاوە ﴿الیس فی جهنم مثوی
للمتکبرین﴾ ئایا بۆ خەڵکانی لە خۆبایی بوو- ئەوانەی ددان بەهەقدا نانێن- لە دۆزەخدا ئەنواو جێگانیە؟ ﴿٦١
وینجی الله الذین اتقوا بمفازتهم﴾ وخوا ئەوانە رزگار دەکا،بەهۆی کاری چاك و هۆکاری رزگارییەوە، خۆیان پاراست

لەدۆزەخ ﴿لايمسهم السوء﴾ نە ناخۆشیەكیان تووش دەبێ ﴿ولا هم يحزنون﴾ ونە غەمباریش ئەبن ﴿[٦٢] الله خلق كل شئ﴾ بەڕاستیی خوا بەدیهێنەری هەموو شتێكە ﴿وهو على كل شئ وكيل﴾ و ئەو بە هەموو شتێكدا ڕادەگا, خۆی سەرپەرستیكاری هەموو شتێك دەكا چۆن حیكمەتی بخوازێ.

**كلیلی ئاسمانەكان و زەوی بە دەست خوایە:**

﴿[٦٣] له مقاليد السموات والارض﴾ كلیلەكانی ئاسمان و زەوی تەنها بە دەست خوایە، چۆنی بوێ دەستكاری ئەكات ﴿والذين كفروا بآيات الله اولئك هم الخاسرون﴾ ئەوانەی كافرو بێباوەڕن بە ئایەتەكانی خوا ئائەوانەن زیانبارەكان و دۆڕاوەكان ﴿[٦٤] قل افغير الله تأمروني اعبد ايها الجاهلون﴾ موشریكەكان داوایان ئەكرد كە پەیامبەرﷺ بەیناوبەین خواكانی ئەوانیش بپەرستێ، جا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوەو فەرمووی: ئەی موحەممەد ﷺ بڵێ: ئەی جا ئێوە فەرمان بە من ئەدەن كە لە باتی خوا بپەرستم ئەی نەزانەكان؟! ﴿[٦٥] ولقد اوحى اليك والى الذين من قبلك﴾ سوێند ئەخۆم كە بێگومان وەحی كراوە بۆ تۆو بۆ ئەوپەیامبەرانەی بەر لە تۆ بوون: ﴿لئن اشركت ليحبطن عملك﴾ كە ئەگەر گریمان بە هاوبەش قایل ببێت بۆخوا، ئەوە بێگومان هەموو كردەوەكانت پووچەڵ دەبێ ﴿ولتكونن من الخاسرين﴾ و لە زیانمەندانیش دەبیت ﴿[٦٦] بل الله فاعبد﴾ نەخێر, هەرگیز بە گوێیان نەكەیت، بەڵكو تەنها هەر خوا بپەرستە ﴿وكن من الشاكرين﴾ و لە شوكرانە بژێرانبە.

**بت پەرستەكان وەك شیاو خوایان نەناسیوە:**

﴿[٦٧] و ما قدروالله حق قدره﴾ ئەوانە وەكو پێویست خوایان نەناسیو ڕێزیان لێنەگرت, ئەگینا چۆن هاوەڵیان بۆ دادەنا؟ ﴿والأرض جميعا قبضته يوم القيامة﴾ لەرۆژی قیامەتدا زەویی هەموو لەناودەستی ئەودایە ﴿والسموات مطويات بيمينه﴾ و ئاسمانەكانیش پێچراونەتەوەو بەدەستی ڕاستیەوەن, گەلێ جار لە فەرموودە كاندا باسی (دەست و پەنجە بۆ خوا هاتووە) ئەڵبەتە ئەوەش هەربەو شێوەیە كە شایستەی زاتی خۆی بێ و بەوجۆرەش.. كۆمەڵی (سەلەف) ئەڵێن: ئەو دوو سیفەتە پیرۆزەیە: (صفة الأصابع والكف)، هەر لەو سیفەتانەن كە پەیوەستە بە زاتی خواوەو هەرگیز لە زاتی موقەددەسی ئەو جیا نابێتەوە: (صفة الأصابع والكف من صفات الله تعالى الذاتية القائمةبه -عزوجل- والتى لا تنفك عن ذاته المقدسة، ولا تتعلق بمشيئته وإرادته، بل هى لازمة لذاته أزلا وأبدا) دیارە سیفە تەكانی تریشی وەك: (الوجه، اليد، العلم، الحياة، القدرة، العزة، السمع، البصر، القدم، الكبرياء) هەر بەو جۆرەیە، وە هەروەها ئەڵێن: سیفەتەكانی تری (فیعلی ئیختیاریی) كە بە زاتی خواوە وەستاون و بە پێی مەشیئەت و ئیرادەیەتی: (كالإ ستواء على العرش، والنزول للسماء الدنيا، والمجئ والاتيان والكلام، والفرح و الضحك والرضا و العجب والحب والبغض والكراهية والقبض والطي والإمساك.. الخ فهي كلها صفاته سبحانه وتعالى وقائمة بذاته المقدسة سواء الذاتية أو الفعلية الاختيارية وصفة الاصابع والكف لله —عزوجل —جاءت بها الأحاديث الصحية الكثيرة) كاتێ كە ئەو زانا جوولەكەیە هات ووتی: (إن الله يضع السموات على أصبع والارضين على أصبع). لەو كاتەدا ئاماژەی بە پەنجەكانی خۆی دەكرد (أخرجه الإمام الترمذي وصححه، والبيهقي و غيرهم). پەیامبەریشﷺ چاوی لێیەوە بووو هیچ نكوڵی و بێزاری لەسەر ئەو كارەی ئەوە دەرنەبڕی، وە هیچ كەسێكیتریش ڕەخنەی لێنەگرت، دیارە بۆیە وایان دەكرد تا بیسەلمێنن كەبەڵێ ڕاستە خوا —جل وعلا— پەنجەی هەیە، بەڵام دیارە نەك وەك پەنجەی دروستكراوەكان، لە فەرموودەیشدا هاتووە كە پەیامبەر ﷺ ئەیفەرموو: ((يقبض الله سمواته بيده

والأرض باليد الأخرى ثم يهزهن..)) واته: كاتێ كه پەیامبەرﷺ فەرمووی: خوا بەدەستێكی ئاسمانەكانی راگرتووە، زەویش بەو دەستەكەی تری، لەو حاڵەتەدا پەنجەكانی خۆی دەجووڵان، اخرجه الشیخان، والنسائی، وابن ماجه، وجماعة عن ابن عمر/ئالووسي.. بەومەبەستە كە ئەو خەڵكە تێبگا خوای گەورە پەنجەو دەستی هەیە، هەروەها كاتێ ئایەتی: (وكان الله سمیعا بصیرا) النساء: (١٣٤)ی دەخوێند دەستی ئەخستە سەر چاوو گوێی خۆی‌و ئاماژەی پێ دەكردن. (فالواجب علینا قبول كل ما جاء به القرآن الكریم والأحادیث النبویة الصحیحة من صفات الله -عزوجل -والإیمان بها والتسلیم لها وإمرارها كما جاءت من غیر تحریف. فمعناها معلوم والكیف مجهول فنحن نثبت ما أثبت الله لنفسه وأثبته له نبیهﷺ من غیر أن نمثل صفاته -عزوجل- بصفات خلقه فهو لیس كمثله شئ لا في ذاته ولا فی صفاته).

الجزء الرابع والعشرون — سورة الزمر

وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلْأَرْضِ
إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَىٰ فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنظُرُونَ
٦٨ وَأَشْرَقَتِ ٱلْأَرْضُ بِنُورِ رَبِّهَا وَوُضِعَ ٱلْكِتَٰبُ وَجِاْيٓءَ
بِٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَقُضِيَ بَيْنَهُم بِٱلْحَقِّ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ
٦٩ وَوُفِّيَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ وَهُوَ أَعْلَمُ بِمَا يَفْعَلُونَ ٧٠
وَسِيقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ زُمَرًا حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا
فُتِحَتْ أَبْوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَآ أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ
يَتْلُونَ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِ رَبِّكُمْ وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ
هَٰذَا قَالُواْ بَلَىٰ وَلَٰكِنْ حَقَّتْ كَلِمَةُ ٱلْعَذَابِ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ
٧١ قِيلَ ٱدْخُلُوٓاْ أَبْوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَا فَبِئْسَ مَثْوَى
ٱلْمُتَكَبِّرِينَ ٧٢ وَسِيقَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْاْ رَبَّهُمْ إِلَى
ٱلْجَنَّةِ زُمَرًا حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا وَفُتِحَتْ أَبْوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمْ
خَزَنَتُهَا سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ طِبْتُمْ فَٱدْخُلُوهَا خَٰلِدِينَ ٧٣
وَقَالُواْ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي صَدَقَنَا وَعْدَهُۥ وَأَوْرَثَنَا ٱلْأَرْضَ
نَتَبَوَّأُ مِنَ ٱلْجَنَّةِ حَيْثُ نَشَآءُ فَنِعْمَ أَجْرُ ٱلْعَٰمِلِينَ ٧٤

وترى الملائكة — ٤٦٦

شیاوی باسیشە چەندین فەرمووده لەبوخاریی و موسلیمەوە هاتوون بۆ سەلماندنی (كف) و (أصابع) بۆخوای گەورە (سبحانه) بۆیە بەندەش قایلە بەوە كە (أسماء)و(صیفات) لە قورئان و فەرموودەكانداچۆن هاتوون، دەبێ بەهیچ شێوەیەك دەستكاری نەكرێن و، وەك خۆیان مانا بكرێن، مەگەر لەولاوە فەرموودەیەكی تری ڕەوان هاتبێ‌وبە جۆرێكی تر تەفسیری بكاتەوە(قال ابن كثیر: وقد وردت أحادیث متعلقة بهذه الآیة: (والسموات..) الطریق فیها وفي أمثالها مذهب السلف وهو إمرارها كما جاءت من غیر تكییف ولا تحریف" وفي الحدیث: ((یقبض الله تعالى الأرض، بیمینه..)).﴿سبحانه وتعالى عما یشركون﴾ خوا پاك و بڵنده لەوشتانە ئەوان ئەیكەنە هاوبەشی.

**فوو كردن بە شەیپووردا، دادگایی و پاداش و تۆڵە:**

﴿٦٨ ونفخ فی الصور﴾ هەركە لەلایەن ئیسرافیلەوە فوو بەشەیپووردا كرا ﴿فصعق من فی السموات ومن فی الأرض﴾ ئیتر ئەو كاتە هەموو ئەوانەی كە لەئاسمانەكان و زەویدان ﴿إلا ماشاء الله﴾ مەگەر كەسێك خوا خۆی بیەوێ نەمرێت، وەكو هەڵگرانی عەرش و..هتد ﴿ثم نفخ فیه أخرى﴾ لەپاشان بۆ جارێكی تر كە فوی پیاكرا ﴿فإذاهم قیام ینظرون﴾ئە وجا لە ناكاو تەواوی دروستكراوەكان لەگۆڕەكانیاندا هەڵئەسنەوە و چاوەڕوانن چییان پێبكرێ ﴿٦٩ واشرقت الأرض بنور ربها﴾ زەویش لەو ڕۆژەدا بەنووری پەروەردگاری خۆی، ڕووناك دەبێتەوە ﴿ووضع الكتاب﴾ وهەموو خەڵكی كۆئەكرێتەوەو نامەی كرداریان لەبەردەمیان دادەنرێ ﴿وجئ بالنبیین والشهداء﴾ و پەیامبەران و، شایەدان لەفریشتەكان ئەهێنرێنە ڕوو و ئامادە ئەبن "بۆئەوەی چی ڕاست و دروستە بیلێن ﴿وقضی بینهم بالحق﴾ وە بەڕاست وعەدل لەنێوانیاندا داوەریی ئەكرێ ﴿وهم لا یظلمون﴾ وە ستەمیشیان لێ ناكرێ ﴿٧٠ ووفیت كل نفس ما عملت﴾ و هەركەس هەرچی كردووە

بەتەواوی‌و بێ کەم و کوڕی پاداشی ئەدرێتەو، وەك ئەم ئایەتە دەفەرموێ: (فلا تظلم نفس شيئا وان كان مثقال حبة من خردل اتينا بها وكفى بنا حاسبين) (٤٧/٢١).. یا ئەم ئایەتە: (إن الله لا يظلم مثقال ذرة) بۆ دووپاتی ئەو مانایەیە. ﴿وهو أعلم بما يفعلون﴾ ئەو خۆی لە هەموو کەس زاناترە، بەوەی ئەوان ئەنجامی ئەدەن، واتە: ئەگەر چی پێویست بەهیچ نامەو شایەتێك نییە، بەلاَم لەگەلٚ ئەوەیشدا نامەو شایەد هەر دەهێنرێ.

**خوانەناسان بەکۆمەلٚ را پێچ دەکرێن بۆ دۆزەخ:**

﴿[٧١] وسيق الذين كفروا إلى جهنم زمرا﴾ وە ئەوانەی باوەڕ یان نەبووە دەستە دەستە بۆ دۆزەخ راپێچ دەکرێن "وەك چۆن لە دونیادا بۆ زیندان ئەنێررێن ﴿حتى إذا جاءوها فتحت أبوابها﴾ هەرکە نزیکبوونەوە لە دۆزەخ، بێ ماتلٚ بوون خێرا دەرگاکانیان بۆ ئەکرێتەوە ﴿وقال لهم خزنتها﴾ و گزیرو دەرگاوانەکانی دۆزەخ پێیان ئەلٚێن: ﴿ألم يـأتكم رسـل منكم يتلـون علـيكم آيات ربكم﴾ ئایـا لـە خۆتـان پەیامبـەرانتان بـۆ نـەهاتبوون کـە ئایەتـەکانی پەروەردگارتان بەسەرا بخوێننەوە؟ ﴿وينذرونكم لقاء يومكم هذا﴾ وە لـەئاکامی گەیشتنی ئەم ڕۆژەش هۆشیارتان بکەنەوە تاکاروکردەوەی ئاوا نەکەن؟ ﴿قالوا بلى ولكن حقت كلمة العذاب على الكافرين﴾ پێی ئ‌ێـئەنێن و دەلٚێن: بەلٚێ پەیامبەران هاتنە لامان و تێیانگەیاندین، ئەبوو بەگوێمان بکردنایە، بەلاَم بەهۆی لاری خۆمانـەوە فەرمانی سزای خوا بڕیاردرا لە سەر کافران. ﴿[٧٢] قيل ادخلوا أبواب جهنم خالدين فيها﴾ بڕیاریان بۆ دەرئەچی‌و ئەوترێ: دەسا لـە دەرگاکانی دۆزەخـەوە بچنە ژوورەوە، بە هەتاهـەتاییش لـەوێ بن ﴿فبئس مثوى المتكبرين﴾ جاجێگای خـەلٚکانی لووت بـەرز و لـەخۆبایی بوو، چـەندە خراپـە، هـەروەك ئـەم کۆمـەلٚـە ئایەتـەیش شێوەی ڕاپێچکردنیان بۆ دۆزەخ ڕوون ئەکاتـەوە: (يـوم يـدعون إلى نـار جهنم دعـا) (١٣/٥٢) (... ونسوق المجرمين إلى جهنم وردا) (٨٦/١٩) (ونحشرهم يوم القيامة على وجوههم عميا وبكما وصما...).

**پارێزگارانیش بۆ بەهەشت بە ڕێ دەکرێن:**

﴿[٧٣] وسيق الذين اتقوا ربهم إلى الجنة زمرا﴾ وە ئەوانـەش پارێزگارییان لەفەرمانەکانی خوای پەروەردگاریان کردووە، دەستە دەستە بەرەو بەهەشت ئەبرێن، دیارە لەوانەدا ئەوانەیان پلەیان لای خوا بەرزترە پێش دەخرێن لەوانـەی لـە خـوار ئەوانـەوەن، وە هەربـەو شـێوە، وە پێغەمبـەران لەگـەلٚ پێغەمبـەران، ئینجا ڕاسـتگۆیان، و پێغەمبەریش ﷺ ئەفەرموێ: من یەکـەم تکاکارم لـەنێو بەهەشتدا، ڕیوایەتی دی دەلٚێ: من یەکەم کەسم لە دەرگای بەهەشت دەدەم (موسلیم). وە لە بەشێکی ئەو فەرموودە درێژەدا کەلەباسی شەفاعەتدا هاتووە دەفەرموێ: (سوێند بەو کەسەی گیانی موحەممەدی بەدەستە، ماوەی نێوان تـەنیا دووتاکە دەرگا لـەدەرگاکانی بەهەشت، بەئەندازەی نێوان (مەککە) و(بوصرا)یە. (متفق عليه). ﴿حتى إذا جاؤها وفتحت أبوابها﴾ تاکاتێ نزیك بەبەهەشت دەبنـەوە، وە دەرگاکانی بۆیان کراوەتەوە. ڕاڤەکەرانی قورئان ئەلٚێن: بۆ دۆزەخییەکان وشـەی (فتحت)ـی هێناوە (واو)ی نەبوو، چـونکە بـاو وایـە دەرگـای زینـدان ئـەو کاتـە دەکرێتـەوە کـە زینـدانی دەگەنـە ئـەوێ، جـا ئەنێررێنـە ناویـەوەو دائەخرێتەوە، بەلاَم دەرگای بەهەشت خۆی بۆ خـۆی هەمیشە کراوەیـەو ئامادەیەو چاوەڕوانی گەیشتنیان ئەکرێ ﴿وقال لهم خزنتها﴾ دەرگاوانانی بەهەشت پێ یان ئەلٚێن: ﴿سلام عليكم طبتم﴾ سلاَوو درووودتان لەسەربێ، بەخێر هاتن، خۆتان پاك ڕاگرت لە دونیادا هەولٚ و تێکۆشان و پاداشتیشتان لێرەدا پاك و خاوێنە، یا خوا نۆشتان بێت ﴿فادخلوها خالـدين﴾ دە بچنە نـاو بەهەشـت بەهەتاهـەتایی لەوێـدا بـن، ئیمـامی (بوخـاریی) لـە (ئـەبو سـەعیدی خودری)یەوە ئەلٚێ: پێغەمبـەر ﷺ فەرمووی: ((يخلص المؤمنون من النار فيحبسون على قنطرة بين الجنة والنار

فيقتص لبعضهم من بعض مظالم كانت بينهم فى الدنيا حتى إذا هذبوا ونقوا أذن لهم في دخول الجنة، فوالذي نفس محمد بيده لأحدهم أهدى بمنزله في الجنة منه بمنزله كان في الدنيا)) في الرقائق (٦٥٣٥) باب (٤٨). واتە: بڕواداران لەئاگر ڕزگار ئەبن و، لەسەر پردێك لەنێوان بەهەشت و دۆزەخدا رادەگیردرێن، پاشان تۆڵەیان لەیەکتر بۆ وەر دەگیردرێ، تابەتەواوی پاك و خاوێن دەکرێن، ئەوجا ڕێ دەدرێن بچنە بەهەشت، سوێند بەوزاتەی کەرۆحی موحەممەدی بەدەستە، بەهەشتییەکان بە منزلی خۆیان لەوێ شارەزاترن، تابەمەنزڵ وجێگاکانی دونیایان. ﴿[٧٤] وقالوا الحمد لله الذي صدقنا وعده﴾ کاتێ چوونە ژوورەوەو نیشتەجێ بوون ئەڵێن: سوپاس وشوکرانە بۆ ئەو خوایەیبە بەڵێنەکەی راستی کرد لە گەڵمان ﴿وأورثنا الأرض نتبوأ من الجنة حيث نشاء﴾ ئەم جێگاو زەویەشی لەو بەهەشتابە ئێمەدا، کەهەرجێگایەکی ئارەزوو بکەین، لێی دەبین ﴿فنعم أجر العاملين﴾ئای کە پاداشتی کارکەران لە ڕێگای خوادا چەندە باشە! ﴿وترى الملائكة حافين من حول العرش﴾ دەبینی کە فریشتەکانیش بەدەوری عەرشدا ئەڵقەیان داوەو﴿يسبحون بحمد ربهم﴾ لەگەڵ سوپاسدا تەسبیحاتی پەروەردگاری خۆیان ئەکەن ﴿وقضى بينهم بالحق﴾ وە داوەری لەنێوان بەهەشتیەکان و دۆزەخیان وهەموو خەڵکان بەهەق و دادگەری تەواو بووە: چاکان ئەبرێن بۆ بەهەشت و، خراپانیش بۆ دۆزەخ ﴿وقيل الحمد لله رب العالمين﴾ لەلایەن بەهەشتیەکانەوە دەوترێ: هەموو سوپاس وشوکرانە، هەربۆ خوای پەروەردگاری جیهانەکان.

لە (١٤١٧/٤/٩)ك بەرامبەر بە (١٩٩٦/٨/٢٣)ز لەنووسینی ئەم سوورەتە بوومەوە لە دوای نوێژی عەسر لەشاری (مەریوان)ی ئێران کاتژمێر (٥:٣٠) زۆر سوپاس بۆخوای گەورە.

*** *** ***

## ٤٠- سوورەتی ( غافیر )ـە
## مەککەییەو ( ٨٥ ) ئایەتە.

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتە وەك سوورەتەکانی تر , بایەخ بە عەقیدەو یەکتاپەرستیی و زیندوو بوونەوەو پاداشت و تۆڵە ئەدات.. زۆرێکیش داکۆکی دەکات بۆ جیاکردنەوەی هەق و ناهەق، ڕێنمایی و گومڕایی، لەگەڵ دیاریکردنی ئەنجامی تاغووتەکان، پاشان سیفەتەکانی خواو هەندێ نیشانەو موعجیزە گەورەکانی، ئەوجا شەڕە قسەو دەمە دەمێی بێ باوەڕەکان، لەگەڵ هێنانی چەند دیمەنێکی سەختی پاشە ڕۆژ، باسی باوەڕوو بێ باوەڕیی، بۆ نموونەی ئەوەیش, ململانێی فیرعەون لەگەڵ موسادا دێنێ..

کۆتاییشی بە باسی ڕۆژی ڕەشی بێ بڕوایان و ملهوڕان دێ.

لەفەزڵ و گەورەیی (حامیم)ەکاندا هاتووە: (الحواميم يسمين: العرائس)الدارمی، (الحواميم ديباج القرآن)/ ابن کثیر. واتە: بە سوورەتە حامیمەکان دەڵێن: بووکە جوانەکان!

جا بەم شێوەیەش دەست پێ ئەکات: ﴿بسم الله الرحمن الرحيم * [١] حم﴾ ئەم جۆرە پیتانە بۆ دەستەوسان کردنی بێ باوەڕەکانەو پێیان ئەڵێ: ئەو قورئانە کە ئێوە نکوولی دەکەن, هەر لەم پیتانە پێکهاتووە، دەفەرموون ئەگەر دەتوانن و لێتان دێت، ئێوەش سوورەتێك وەك ئەو بێنن ﴿[٢] تنزيل الكتاب من الله العزيز العليم﴾ دابەزاندنیئەم کتێبە (قورئان) لەخوای بەدەسەڵاتی زاناوەیە ﴿[٣] غافر الذنب وقابل التوب شديد العقاب﴾ تاوانپۆش وتەوبە وەرگری توندگرە ,واتە: لێبوردەی گوناهانی رابووردوو و، وەرگری پەشیمانیی و تەوبە لەئاییندەدا , تۆڵە و

قاری سەختە، وەك لەئایەتی تردا ئەفەرمووێ: (نبئ عبادی أنی أنا الغفور الرحیم وأن عذابی هو العذاب الألیم)١٥/٤٩-٥٠. ﴿ذی الطول﴾ خاوەن بەخشش و نیعمەتی زۆرە، هەر ئەوەیە کە دەفەر موێ: (وإن تعدوا نعمة الله لا تحصوها)١٤/٣٤. ﴿لا إله إلا هو﴾ هیچ پەرستراوێکی راستەقینە نیە ئەو نەبێ ﴿إلیه المصیر﴾ گەڕانەوەی هەمووان هەر دێتەوە لای ئەو ، چارەنووس و پاداش هەر لای ئەوە.

**خوانەناس هەر خەریکی کێشەیە لەمەڕ ئایەتەکانی خوا:**

﴿[4] ما یجادل في آیات الله إلا الذین کفروا﴾ هەر ئەوانە لەبارەی ئایەتەکانی خواوە ململانێ و دەمبازی ئەکەن - لەرووی عینادەوە- کافرو بێ باوەڕن، هەر ئەوانەشن کە جارێ ئەڵێن: قورئان شیعرو هۆنراوەیە، جارێ دیکە ئەڵێن: جادوو و سیحرە..!! ﴿فلا یغررك تقلبهم في البلاد﴾ جابا هەڵسووڕانیان لە شاراندا تۆ فریونەدا ، واتە:درێژەدان بەدروستکردنی خانوو بەرەو، کشتوکاڵ وبازرگانیی و، بە دەست هێنانی ماڵ و سامان، نیشانەی مانەوەو بەختیاریی گەلان نیە ﴿[5] کذبت قبلهم قوم نوح والأحزاب من بعدهم﴾ پێش ئەوانیش خەڵکێکی زۆر، بەتایبەت گەلی نوح و، ئەو گرووپانەش دوای ئەوان بوون ململانێیان کردو ، دەستە دەستە دژ بە پێغەمبەرەکانیان وەستان و بڕوایان پێنەکردن ﴿وهمت کل أمة برسولهم لیأخذوه﴾ وهەرئوممەتەشیان لێبڕاوە لەگەڵ پەیامبەرەکەیدا خراپە بکات: یان بیگری و بیکوژێ، یان جەزرەبەو سزای بدات ﴿وجادوا بالباطل لیدحضوا به الحق﴾ وە بۆ سڕینەوەی هەق و راستیی، دەستیان دایە دەمە قاڵێ و شەڕە قسەو کاری باتڵ لەگەڵ پەیامبەرەکەیاندا، تا هەق لەبن بێنن و ناهەق سەربخەن ﴿فأخذتهم﴾ ئینجا منیش - هەریەکەیان بەجۆرە سزایەك- قارم لێگرتن و فەوتاندنم ﴿فکیف کان عقاب﴾ جا ئایا تۆڵەو سزای من چۆن بوو؟ ﴿[6] وکذلك حقت کلمة ربك علی الذین کفروا﴾ هەرچۆنێك سزای گەلانی پێشو هاتە دی، هەر بەهەمان شێوەش فەرمانی پەروەردگارت دەربارەی ئەوانەی وا کافرو بێ باوەڕ بوون لە قورەیش هاتە دی: ﴿إنهم أصحاب النار﴾ کە ئەوانە بەراستی هەموو دۆزەخین.



**هەڵگرانی تەختی خوا:**

﴿[7] الذین یحملون العرش ومن حوله﴾ ئەو فریشتانەی عەرشی خوا هەڵدەگرن و ئەوانەی کەبەدەوری ئەودان ﴿یسبحون بحمد ربهم﴾ هەردەم سوپاس و پاك و خاوێنی پەروەردگاریان ئەڵێن و، لەهەر ناتەواوی و کەم و کوڕییەك دوور رای دەگرن ﴿ویؤمنون به﴾ وددان هەر بە بوونی ئەودا ئەنێن ،واتە: بڕوا هێنان زۆر گرنگە، جا ئێوەش دەبێ وەك ئەوان بن ﴿ویستغفرون للذین آمنوا﴾ داوای لێبوردن بۆ بڕواداران ئەکەن، لەبەر ئەو پەیوەندیە ئیمانییە لە نێوانیاندایە ﴿ربنا وسعت کل شئ رحمة وعلما﴾ ئەڵێن: ئەی پەروەردگاری هەموان! رەحمەت و

میهرەبانیی و زانیاریی تۆ هەمووشتێکی داگرتووە، واتە: میهرەبانیی تۆ زۆر گەوەترو فراوانترە لەگوناهو تاوانەکانی ئەوان و، خۆیشت بەحاڵ و ئەحواڵیان چاك ئەزانیّ ﴿فاغفر للذین تابوا واتبعوا سبیلك﴾ جالەوانەی تەوبەیان کردووەو، شوێنی رێگە راستەکەی تۆ کەوتوون، لە گوناهەکانیان ببوورە ﴿وقهم عذاب الجحیم﴾ و لەسزای دۆزەخ بیانپارێزە ﴿[٨] ربنا وادخلهم جنات عدن التی وعدتهم﴾ ئەی پەروەردگاری ئێمە! بیانخە ناو چەند باخاتێکی بەهەشت کە هەمیشەیین و بۆ خۆت بەڵێنت پێداون ﴿ومن صلح من آبائهم وازواجهم وذریاتهم﴾ و هەروەها چاکان لەباوو باپیرانی ئەوان، وە خێزان و منداڵانیان، بەیەکەوە لەبەهەشتدا کۆ بکەوە، ئەگەرچی کردەوەیشیان یەکسان نەبێ، بۆ ئەوەی زیاتر پێکەوە دڵخۆش بن ﴿إنك انت العزیز الحکیم﴾ بەراستیی هەر ئەتۆ دەسەڵاتداری کار جوانیت ،دەسەڵاتت هەیەو، چاك ئەزانی چی دەکەیت ﴿[٩] وقهم السیئات﴾ و لەو کارە خراپانەش بیانپارێزەو لێیان مەگرە ﴿ومن تق السیئات یومئذ فقد رحمته﴾ خۆ تۆش لەدەرەنجامی ئەو کارەخراپانە، هەرکەس بپارێزیی لەو رۆژەدا، ئەوە بەر بەزەییت کەوتووە و میهرەبانیت لەگەڵ کردووە ﴿وذلك هو الفوز العظیم﴾ ئائەوەشە سەرکەوتنە گەورەو بێ وێنەکە.

**خوانەناسان کە چوونە جەهەننەم پەشیمان دەبنەوە:**

﴿[١٠] إن الذین کفروا ینادون لمقت الله اکبر من مقتکم انفسکم﴾ بێگومان لەقیامەتدا هاوار لەوانە دەکرێت کە لەدونیادا خوا نەناس بوون: کە ئەمڕۆ رق و تووڕەیی خوا بەرامبەر بەئێوە لەتووڕەیی و دژایەتی ئێوە لە خۆتان گەورەترو زیاترە ﴿إذ تدعون إلی الإیمان فتکفرون﴾ چونکە کاتێ بانگ دەکران بۆ باوەڕهێنان، کەچی حاشاتان دەکرد! واتە: لەوکاتەدا چەندە لە خۆبێزارن،خوای گەورە چەند بەرامبەری ئەوە بێزارە لێتان ﴿[١١] قالوا ربنا امتنا اثنتین واحییتنا اثنتین﴾ بێ بڕواکان کاتێ تەنگەتاوو نارەحەت ئەبن ئەڵێن: پەروەردگاری ئێمە! تۆ دووجاران مراندووتین، جارێ لە سەرەتاوە لە نەبوونەوە بەدیت هێناین، پاشان مراندتین، دوو جارانیش ژیانت بەبەردا کردووین، بۆ یەکەمجار گیانت بەبەرماندا کرد، پاشان مردین و زیندووت کردینەوە، وەك دەفەرمووێ: (کیف تکفرون بالله وکنتم أمواتا فأحیاکم ثم یمیتکم ثم إلیه ترجعون) ٢٨/٢. یان دەفەرموێ: (ولو تری إذ وقفوا علی النار فقالوا یالیتنا نرد ولا نکذب بآیاتنا ربنا ونکون من المؤمنین) ٢٧/٦. یان دەفەرموێ: (وهم یصطرخون فیها ربنا أخرجنا)٣٧/٣٥. یان دەفەرموێ: (فاعترفنا بذنوبنا) ١١/٤٠. جا وا ئێستا ددان بەگوناهانی خۆماندا دەنێین ﴿فهل إلی خروج من سبیل﴾ دەئایا دەرەتان و رێگەیەك هەیە بۆ دەرچوون لە سزا و جارێکی تر بگەڕێینەوە بۆ دونیاو بەگوێت بکەین؟ ﴿[١٢] ذلکم بأنه إذا دعی الله وحده کفرتم﴾ ئەو سزاو تۆڵەیەشتان لەبەر ئەوەیە، چونکە کاتێ بانگکرابان بۆ بڕواهێنان و پەرستنی خوای تاك و تەنیا، بەتەنیا کافر دەبوون وباوەڕتان

الجزء الرابع والعشرون — سورة غافر

رَبَّنَا وَأَدْخِلْهُمْ جَنَّٰتِ عَدْنٍ ٱلَّتِى وَعَدتَّهُمْ وَمَن صَلَحَ
مِنْ ءَابَآئِهِمْ وَأَزْوَٰجِهِمْ وَذُرِّيَّٰتِهِمْ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ
ٱلْحَكِيمُ ﴿٨﴾ وَقِهِمُ ٱلسَّيِّـَٔاتِ وَمَن تَقِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ
يَوْمَئِذٍ فَقَدْ رَحِمْتَهُۥ وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٩﴾ إِنَّ
ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يُنَادَوْنَ لَمَقْتُ ٱللَّهِ أَكْبَرُ مِن مَّقْتِكُمْ
أَنفُسَكُمْ إِذْ تُدْعَوْنَ إِلَى ٱلْإِيمَٰنِ فَتَكْفُرُونَ ﴿١٠﴾
قَالُوا۟ رَبَّنَآ أَمَتَّنَا ٱثْنَتَيْنِ وَأَحْيَيْتَنَا ٱثْنَتَيْنِ فَٱعْتَرَفْنَا بِذُنُوبِنَا
فَهَلْ إِلَىٰ خُرُوجٍ مِّن سَبِيلٍ ﴿١١﴾ ذَٰلِكُم بِأَنَّهُۥٓ إِذَا دُعِىَ
ٱللَّهُ وَحْدَهُۥ كَفَرْتُمْ وَإِن يُشْرَكْ بِهِۦ تُؤْمِنُوا۟ فَٱلْحُكْمُ لِلَّهِ
ٱلْعَلِىِّ ٱلْكَبِيرِ ﴿١٢﴾ هُوَ ٱلَّذِى يُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُنَزِّلُ
لَكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ رِزْقًا وَمَا يَتَذَكَّرُ إِلَّا مَن يُنِيبُ ﴿١٣﴾
فَٱدْعُوا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿١٤﴾
رَفِيعُ ٱلدَّرَجَٰتِ ذُو ٱلْعَرْشِ يُلْقِى ٱلرُّوحَ مِنْ أَمْرِهِۦ عَلَىٰ مَن
يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ لِيُنذِرَ يَوْمَ ٱلتَّلَاقِ ﴿١٥﴾ يَوْمَ هُم بَٰرِزُونَ لَا يَخْفَىٰ
عَلَى ٱللَّهِ مِنْهُمْ شَىْءٌ لِّمَنِ ٱلْمُلْكُ ٱلْيَوْمَ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴿١٦﴾

اليوم تجزى ٤٦٨

نەدەهێنا ﴿وان یشرك به تؤمنوا﴾ خۆ ئەگەر هاوبەشی پاڵ درابا (باسی لات و عوززاش لە گەڵیان کرابا) بڕواتان ئەهێنا! ﴿فالحكم لله العلی الكبیر﴾ جا بڕیارو داوەری کردن تەنها بۆ خوای باڵادەستی گەورە , چونکە بتان هیچیان بەدەست نیە ﴿[١٣] هو الذی یریكم آیاته﴾ ئەو خوایەیە نیشانەکانی گەورەیی وتاك وتەنیایی‌خۆی نیشانتان ئەدات , لەزەوی و لەئاسمان ﴿وینزل لكم من السماء رزقا﴾ وە لەئاسمانەوە رزق و رۆزیی وبارانتان بۆ دەبارێنێ ﴿وما یتذكر إلا من ینیب﴾ هەموو کەسێك پەندو وەرناگرێ، مەگەر کەسێك پەند وەرگرێ ,بگەرێتەوە لە شیرك و گوێرایەڵ بێت بۆخوا (الله).

**هانا هەر بۆ خوا بەرن و هەر ئەویش بپەرستن:**

﴿[١٤] فادعوا الله مخلصین له الدین﴾ جا تەنها هاوار لەخوا بکەن و ئەو بپەرستن بەپوختی ئەی موسڵمانان! ﴿ولو كره الكافرون﴾ ئەگەرچی خوانەناسان و بێ بڕوایان پێیان ناخۆش بێت. پێغەمبەر ﷺ پاش نوێژە فەرزەکان دەیگوت: ((لا إله إلا الله وحده لاشریك له، له الملك وله الحمد، وهو علی كل شئ قدیر، لا حول ولا قوة إلا بالله، لاإله إلاالله، ولا نعبد إلا إیاه، له النعمة وله الفضل وله الثناء الحسن، لا إله إلا الله مخلصین له الدین ولو كره الكافرون)) مسلم: ٤١٥/١. ﴿[١٥] رفیع الدرجات﴾ بەرز کەرەوەی پلەکانی ئیمانداران وزانیاریانە ﴿ذو العرش﴾ خاوەنی عەرشە, دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە ﴿یلقی الروح من أمره علی من یشاء من عباده﴾ وەحی بەفەرمانی خۆی دەکا بۆ هەرکەسێك خۆی بیەوێ لە بەندەکانی ﴿لینذر یوم التلاق﴾ تا لەڕۆژی بەیەك گەیشتن و کۆکردنەوە بیان ترسێنیت ﴿[١٦] یوم هم بارزون﴾ ڕۆژێ کەهەموو ئاشکران و بەدەرەون، ئەکەونە پێش چاوو، هیچ شتێك نیە بیانشارێتەوە چونکە لەدەشتێکی کاکی بەکاکیدان ﴿لایخفی علی الله منهم شئ﴾ هیچ شتێکیان لەخوا ناشارێتەوە ﴿لمن الملك الیوم﴾ لەو ڕۆژەدا کە ئاسمانەکان پێچرانەوە جارچییەك جاڕ ئەدات و ئەڵێت: موڵك و دەسەڵات و فەرمانڕەوایی‌و بڕیار ئەمڕۆ بۆ کێیە؟ "هەمووی بێ دەنگ و بێ وەڵامە، بۆیە خوای گەورە خۆی وەڵام ئەداتەوەو ئەفەرموێ: ﴿لله الواحد القهار﴾ هەر بۆ خوای تاك و تەنیای بەدەسەڵاتە، ئیمامی (بوخاري) ئەم فەرموودەیە دەهێنێت، کەلەکاتی وەرگرتنەوەی ڕۆح و زەویی‌و ئاسمانەکاندا خوا ئەفەرموێ: (انا الملك أین ملوك الارض؟) ئیمامی (موسلیم)یش ئەم فەرمودەیە دێنێ: ((یطوي الله- عزوجل- السماوات یوم القیامة ثم یأخذهن بیده الیمنی، ثم یقول: انا الملك أین الجبارون؟ أین المتكبرون؟ ثم یطوي الأرضین بشماله ثم یقول: انا الملك أین الجبارون؟ أین المتكبرون؟. ﴿[١٧] الیوم نجزی كل نفس بماكسبت﴾ لەو ڕۆژەدا هەرکەس هەرچی کردووە پاداشت و تۆڵەی کاری خۆی دەبینێ ﴿لا ظلم الیوم﴾ لەو ڕۆژەدا هیچ جۆرە ستەم و غەدرێك نییە , بێ زیادوکەم هەمووکەسێك پاداشت و تۆڵە ئەدرێتەوە ﴿إن الله سریع الحساب﴾ بەڕاستیی خوا زوو و بەپەلە حیساب و لێکۆڵینەوەدەکات.

**بترسن لەو ڕۆژە لەناکاو تووشتان دەبێ:**

﴿[١٨] وانذرهم یوم الآزفة﴾ ئەوانە لەڕۆژە نزیکەکەی (قیامەت) بترسێنە. (آزفة) یەکێکە لەناوەکانی ڕۆژی قیامەت. بۆیە دەوترێ (آزفة) چونکە نزیکە بێت ,خودا دەفەرموێ (أزفت الآزفة). ﴿إذ القلوب لدی الحناجر﴾ کاتێ لەترس و هەیبەتا گیان و دڵەکان دەگەنە گەروو و رادەوەستن ﴿كاظمین﴾ بەپیشخواردوویی دڵەکانیان پڕن لە خەم وخەفەت. ﴿ما للظالمین من حمیم﴾ ئەوکات ستەمکاران هیچ پشتیوان و دۆستێکیان نیە, بتوانێ کەڵکیان پێ بگەیەنێ ﴿ولا شفیع یطاع﴾ و هیچ تکاکارێکیشیان نیە، تکای وەربگیردرێ, هەموو پەیوەندییەك دەبچڕێ ﴿[١٩] یعلم خائنة الأعین﴾ ئەو خوایە هەمیشە بەچاوەخیانەتکارەکان - بەرامبەر بە نافەرمانی خۆی- دەزانێت ﴿وما تخفی الصدور﴾ و

بەوەش سینەکان حەشاری دەدەن ﴿٢٠ واللە یقضی بالحق﴾ و خوا بەڕاستی و دادگەرانە بڕیار ئەدا و تۆڵەو پاداش ئەداتەوەو، ستەم لە هیچ کەسێك ناکات ﴿والذین یدعون من دونه لا یقضون بشئ﴾ و ئەوانەی ئەوان هانایان دەبەنە بەرو ئەیانپەرستن جگە لەخوا ناتوانن هیچ جۆرە بڕیارێك بدەن ودەسەڵاتی هیچیان نی یەو هیچ نازانن ﴿إن اللە هوالسمیع البصیر﴾ بێشك کەخودا هەربۆخۆی ژنەواو بینایە، ئاگاداری هەموو کارو کردارێکیانە.

**پاشەڕۆژی کافران:**

﴿٢١ اولم یسیروا فی الأرض﴾ ئایا ئەوانە بەرووی زەویدا نەگەڕاون؟ ﴿فینظروا کیف کان عاقبة الذین کانوا من قبلهم﴾ تا سەیر بکەن و بزانن پاشەڕۆژو ئەنجامی ئەوانەی لە پێشیانەوە بوون و، لەژیانیاندا ململانێیان لەگەڵ پەیامبەرەکانیاندا ئەکرد چۆن بوو؟ ﴿کانوا اشد منهم قوة وآثارا فی الأرض﴾ خۆ لە قورەیش هێزو تواناو جێگاو شوێنەوارو کۆشك و تەلاریشیان زۆرترو بەهێز تر بوو ﴿فأخذهم اللە بذنوبهم﴾ کەچی بەهۆی گوناهەکانیانەوە خوا بەتوندی گرتنی ﴿وماکان لهم من اللە من واق﴾ لە بەرامبەر ئەو سزایشەوە هیچ پارێزگارێکیشیان نەبوو , تکایەکیان بۆبکاو لایان بدا لێی ﴿٢٢ ذلك بأنهم کانت تأتیهم رسلهم بالبینات﴾ ئەو سزایەش بەهۆی ئەوەوە بوو کە پەیامبەرەکانیان بە گەڵێ نیشانەو بەڵگەی ڕۆشنەوە دەهاتن بۆ لایان ﴿فکفروا﴾ کەچی ئینکارییان کرد ﴿فأخذهم اللە﴾ ئینجا خواش بەتوندی گرتنی ﴿إنه قوی شدید العقاب﴾ چونکە بەڕاستیی ئەو خوایە بەهێزو تۆڵە سەختە.

**داستانی مووساو فیرعەون:**

﴿٢٣ ولقد ارسلنا موسی بآیاتنا وسلطان مبین * ٢٤ الی فرعون وهامان وقارون﴾ سوێند ئەخۆم کە بە ڕاستی ئێمە (موسا )مان ڕەوانە کرد بەگەڵێ ئایەت و بەڵگەی ئاشکراوە– دەستەسپییەکە یی و، دار دەستەکەیی –بۆ لای فیرعەونی ملهوڕو، هامانی وەزیریی و، قاروونی سەروەتمەندی لەخۆبایی بوو ﴿فقالوا ساحر کذاب﴾ کەچی لەباتی ئەوەی ئیمان بێنن، وتیان: مووسا جادوگەرێکی درۆزنە!! بۆیە ئەو دەست و دار دەستەیەی وایان لێ دێت! درۆیش ئەکات ئەڵێ: خوا ناردوومی ﴿٢٥ فلما جاءهم بالحق من عندنا﴾ جا کە مووسا لەلایەن ئێمەوە بەبەڵگەی ڕاست و ڕەواوە هاتە لایان و هەموو ڕاستییەکی بۆ ڕوونکردنەوە ﴿قالوا اقتلوا أبناء الذین آمنوا معه﴾ وتیان: کوڕانی ئەوانە بکوژن کە بڕوایان هێناوەو لەگەڵ ئەون، تا لەئاییندەدا زۆر نەبن و پاشبڕ ببن ﴿واستحیوا نساءهم﴾، و مێینەکانیشیان بۆ خزمەتگوزاریی زیندوو ڕابگرن ﴿وما کید الکافرین إلا فی ضلال﴾ خۆفرت و فێڵ و پیلانگێڕی بێ باوەڕان، هەر لەنابووتبووندایە، ئەوە بوو نەیانتوانی ڕێگرییان لێ بکەن لەبڕواو بنەبڕیشیان نەکردن، وەك خۆیان

الجزء الرابع والعشرون سُورَةُ غَافِر

ٱلْيَوْمَ تُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ ۚ لَا ظُلْمَ ٱلْيَوْمَ ۚ إِنَّ
ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿١٧﴾ وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ ٱلْـَٔازِفَةِ إِذِ ٱلْقُلُوبُ
لَدَى ٱلْحَنَاجِرِ كَـٰظِمِينَ ۚ مَا لِلظَّـٰلِمِينَ مِنْ حَمِيمٍ وَلَا شَفِيعٍ
يُطَاعُ ﴿١٨﴾ يَعْلَمُ خَآئِنَةَ ٱلْأَعْيُنِ وَمَا تُخْفِى ٱلصُّدُورُ ﴿١٩﴾
وَٱللَّهُ يَقْضِى بِٱلْحَقِّ ۖ وَٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَقْضُونَ
بِشَىْءٍ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿٢٠﴾ ۞ أَوَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى
ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ كَانُوا۟ مِن قَبْلِهِمْ ۚ
كَانُوا۟ هُمْ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَءَاثَارًا فِى ٱلْأَرْضِ فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ
بِذُنُوبِهِمْ وَمَا كَانَ لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن وَاقٍ ﴿٢١﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ
كَانَت تَّأْتِيهِمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَـٰتِ فَكَفَرُوا۟ فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ ۚ إِنَّهُۥ
قَوِىٌّ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٢٢﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَـٰتِنَا
وَسُلْطَـٰنٍ مُّبِينٍ ﴿٢٣﴾ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَهَـٰمَـٰنَ وَقَـٰرُونَ
فَقَالُوا۟ سَـٰحِرٌ كَذَّابٌ ﴿٢٤﴾ فَلَمَّا جَآءَهُم بِٱلْحَقِّ مِنْ
عِندِنَا قَالُوا۟ ٱقْتُلُوٓا۟ أَبْنَآءَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ وَٱسْتَحْيُوا۟
نِسَآءَهُمْ ۚ وَمَا كَيْدُ ٱلْكَـٰفِرِينَ إِلَّا فِى ضَلَـٰلٍ ﴿٢٥﴾

٤٦٩

مەبەستیان بوو ﴿[٢٦] وقال فرعون ذرونی اقتل موسی﴾ بەوەشەوە نەوەستان، بەڵکو فیرعەون وتی: وازم لێ بێنن تا موسا بکوژم ,ئیتر لەهەمو شتێ رزگارتان ئەبێ ﴿ولیدع ربه﴾ جا با ئەویش هاوار بەرێ بۆ پەروەردگاری خۆی! رزگاری بکات ﴿إنی اخاف أن یبدل دینکم﴾ چونکە بەڕاستیی من ئەترسم کە ئایینەکەتان بگۆڕێ و لێتان تێك بدات ﴿أو أن یظهر فی الأرض الفساد﴾ یان خراپەو فەساد لەم زەوییە بنێتەوە و نێوانتان تێك بدات، دیارە زۆر جێگەی گاڵتەو پێکەنینە، کە فیرعەونێکی وا بەموسا بڵێت: من دەترسم فەساد بڵاو بکاتەوە! گومان نیە کە باوی هەموو یاخیی بووان هەر وایە, کاتێ کە خۆیان بەچاك و پاك و راست ئەزانن، ئەیانەوێ بەو جۆرە وتانە سۆزی گەل و کۆمەڵ بۆ خۆیان بورووژێنن!! جا کەهیچیان بۆ نەمایەوە، ئەوجا دەست ئەکەن بەئامۆژگاریی و ئەبنە واعیزیی دینیی! ﴿[٢٧] وقال موسى إنی عذت بربی وربکم﴾ موسا وتی: بەڕاستیی من پەنا دەبەمە بەر پەروەردگاری خۆم و, پەروەردگاری ئێوەش ﴿من کل متکبر لا یؤمن بیوم الحساب﴾ کە بمپارێزێ لەهەر مرۆڤێکی لەخۆبایی بوو, کە باوەڕ ناکا بەڕۆژی حیساب و پاداشت و تۆڵە ﴿[٢٨] وقال رجل مؤمن من آل فرعون یکتم إیمانه﴾ ئەوسا پیاوێکی ئیماندار لە دەستە وبەستەی فیرعەون (لە قیبیتیەکان) هێمان بڕوای خۆی ئەشاردەوەو نەیئەوێرا خۆی دەرخا، کاتێ کە ئەو هەڕەشەو گوڕەشەیەی لێ بیستن بەرامبەر بە موسا وتی: ﴿اتقتلون رجلا أن یقول ربی الله﴾ ئایا ئێوە پیاوێکی وەهادەکوژن، کە ئەڵێ: پەروەردگارم (الله) یە , ئایا ئێوە قسەی ئاوا بە تاوان ئەزانن و فەرمانی کوشتنی بۆ دەر ئەکەن! ﴿وقد جاءکم بالبینات من ربکم﴾ کە بێگومان لەلایەن پەروەردگارتانەوە بەڵگەو نیشانەیەکی زۆریشی بۆ هێناون ﴿وإن یك کاذبا فعلیه کذبه﴾ گریمان ئەگەر درۆش بکات، وەباڵی درۆکەی لەسەر خۆیەتی ﴿وإن یك صادقا یصبکم بعض الذی یعدکم﴾، خۆ ئەگەر قسەی راست بکا، ئەوا هەندێ لەو هەڕەشەیەی ئەو بەڵێنی پێداون ئەوقەتان ئەبێت ﴿إن الله لا یهدی من هو مسرف کذاب﴾ چونکە بەڕاستیی خوا مرۆی زیادە رەوکارو درۆزن, شارەزاو رێنمایی ناکات , چونکە درۆی کردۆتە پیشەی خۆی. ﴿[٢٩] یاقوم لکم الملك الیوم ظاهرین فی الأرض﴾ پیاوە ئیماندارەکەی خزمی فیرعەون وتی: ئەی هۆزی من! وا ئەمڕۆ دەسەڵات بۆ ئێوەیە, هەر ئێوەیش لەمیسردا دەسەڵاتدارن ,جا لەخۆتانی تێك مەدەن و خەڵکەکەی مەچەوسێننەوە ﴿فمن ینصرنا من بأس الله إن جاءنا﴾ جا کێ بەرگریمان ئەکات لە سزای خوا، ئەگەربۆمان هات؟! ﴿قال فرعون ما أریکم إلا ما أری﴾ فیرعەون پاش ئەو هەموو ئامۆژگاریە -پیاوە ئیماندارەکە کردی- وتی: من هەر ئەو راوبۆچوونە بەچاك دەبینم خستمە بەر چاوتان، واتە: لە کوشتنیموسا بولاوە, شتێکی تر بەباش نابینم ﴿وما أهدیکم إلا سبیل

سُورَةُ غَافِرٍ — الجُزْءُ الرَّابِعُ وَالعِشْرُونَ

وَقَالَ فِرْعَوْنُ ذَرُونِيٓ أَقْتُلْ مُوسَىٰ وَلْيَدْعُ رَبَّهُۥٓ ۖ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمْ أَوْ أَن يُظْهِرَ فِي ٱلْأَرْضِ ٱلْفَسَادَ ﴿٢٦﴾ وَقَالَ مُوسَىٰٓ إِنِّي عُذْتُ بِرَبِّي وَرَبِّكُم مِّن كُلِّ مُتَكَبِّرٍ لَّا يُؤْمِنُ بِيَوْمِ ٱلْحِسَابِ ﴿٢٧﴾ وَقَالَ رَجُلٌ مُّؤْمِنٌ مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَكْتُمُ إِيمَٰنَهُۥٓ أَتَقْتُلُونَ رَجُلًا أَن يَقُولَ رَبِّيَ ٱللَّهُ وَقَدْ جَآءَكُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ مِن رَّبِّكُمْ ۖ وَإِن يَكُ كَٰذِبًا فَعَلَيْهِ كَذِبُهُۥ ۖ وَإِن يَكُ صَادِقًا يُصِبْكُم بَعْضُ ٱلَّذِي يَعِدُكُمْ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِي مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ كَذَّابٌ ﴿٢٨﴾ يَٰقَوْمِ لَكُمُ ٱلْمُلْكُ ٱلْيَوْمَ ظَٰهِرِينَ فِي ٱلْأَرْضِ فَمَن يَنصُرُنَا مِنۢ بَأْسِ ٱللَّهِ إِن جَآءَنَا ۚ قَالَ فِرْعَوْنُ مَآ أُرِيكُمْ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهْدِيكُمْ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴿٢٩﴾ وَقَالَ ٱلَّذِيٓ ءَامَنَ يَٰقَوْمِ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيْكُم مِّثْلَ يَوْمِ ٱلْأَحْزَابِ ﴿٣٠﴾ مِثْلَ دَأْبِ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ وَٱلَّذِينَ مِنۢ بَعْدِهِمْ ۚ وَمَا ٱللَّهُ يُرِيدُ ظُلْمًا لِّلْعِبَادِ ﴿٣١﴾ وَيَٰقَوْمِ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ يَوْمَ ٱلتَّنَادِ ﴿٣٢﴾ يَوْمَ تُوَلُّونَ مُدْبِرِينَ مَا لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِنْ عَاصِمٍ ۗ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴿٣٣﴾

وَلَقَدْ جَآءَكُمْ — ٤٧٠

الرشاد﴾ چاکیش بزانن کە من تەنها ڕێگای هیدایەتان نیشان ئەدەم، فیرعەونیش لەگەڵ نەتەوەکەیدا هەر درۆ دەکات، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((مامن إمام یموت, یوم یموت وهو غاش لرعیته، إلا لم یرح رائحة الجنة، وإن ریحها لیوجد من مسیرة خمسمأة عام) فتح الباري: ١٣/١٣٦٥. ﴿[30] وقال الذی آمن یا قوم إنی أخاف علیکم مثل یوم الأحزاب﴾ پیاوە خاوەن بڕواکە وتی: خزمینە! بەڕاستی من لە ڕۆژێ دەترسم بەسەرتانا بێت, وەك ڕۆژی گرووپەکان , واتە: وەك ڕۆژی ئەوانەی کە بەرامبەر بەپێغەمبەرەکانیان دەستە دەستە وەستان و چوون بەگژیاندا ﴿[31] مثل دأب قوم نوح وعاد وثمود﴾ وەکو حاڵی گەلی نوح و عادو سەموود,لەوسزایە ئەوقەی ئەوان بوو ﴿والذین من بعدهم﴾ و ئەو کەسانەش لەپاش ئەوانەوە هاتن ,وەك گەلەکەی لووط ﴿وما الله یرید ظلما للعباد﴾ خۆ خوا نایەوێ ناهەقی و ستەم لە بەندەکانی خۆی بکا، کەوابوو ئەوە بەرهەمی دەستی خۆیانە ﴿[32] ویا قوم إنی أخاف علیکم یوم التناد﴾ ئەی هۆزەکەم! بەڕاستیی من ئەترسم لەڕۆژێ کە خەڵکی بانگ و هاوار لە یەکتر ئەکەن و داوای یارمەتی لەیەکتر ئەکەن، دەترسم لەو ڕۆژەدا تووش ببن و ببێتە هاوار هاوارتان ﴿[33] یوم تولون مدبرین﴾ ئەو ڕۆژە کە هەمووتان هەڵدێن بە پشت هەڵکردوویی لەبەردەم سزای سەختی دۆزەخدا ﴿مالکم من الله من عاصم﴾ هیچ پارێزەرێکیشتان نیە لەسزای خوا بتانپارێزێ ﴿ومن یضلل الله فما له من هاد﴾ ئەوانە خوا گومڕای کردوون، هەرکەسێکیش خوا گومڕای بکات - بەهۆی لاریی خۆیەوە- ئیتر هیچ ڕێ نیشاندەرێکی نیە بۆ ڕێگای ڕاست ببیات ﴿[34] ولقد جاءکم یوسف من قبل بالبینات﴾ سوێند بە خوا (یوسف)یش پێش هاتنی موسا بەچەندان بەڵگەو نیشانەی ڕوونەوە هاتە لاتان بۆ ڕێنموونیتان، جا قسەی ڕاست وەك ئیبن کەسیر ئەڵێ ئەوەیە کە ئەم (یوسف)ـە، (یوسف)ی کوڕی (یەعقووب)ـە/ سەلاویان لێ بێ, پێشهاتنی مووسا ؑ خوا ناردیە لای قیبتیەکان. ﴿فمازلتم فی شك مما جاءکم به﴾ کەچی لەپەیامەکەی ئەویش کە پێی هاتبوو بۆتان, هەر لەگومان و دوودڵییدا بوون , و بڕواتان پێنەکرد، دیارە مەبەست باوو باپیرانیانە ﴿حتی إذا هلك قلتم لن یبعث الله من بعده رسولا﴾ هەتا کاتێ مرد (یوسف) ئەوسا وتتان: ئیتر هەرگیز خوا دوای ئەو هیچ پەیامبەرێکی تر نانێرێ ﴿کذلك یضل الله من هو مسرف مرتاب﴾ وەك ئەم گومڕا کردنە, خوا هەر کەسێکی سەرکەش و گوماندار گومڕاو سەرلێشێواو ئەکات ﴿[35] الذین یجادلون فی آیات الله بغیر سلطان أتاهم﴾ ئەمە کۆتایی ئامۆژگارییەکانی پیاوە موسوڵمانە کەی ئالی فیرعەونە: ئەوانەی کەموجادەلە دەکەن لەشانی بەڵگەو ئایەتەکانی خوا، بێ ئەوەی هیچ بەڵگەو نیشانەیەکیان بۆهاتبێ لە خواوە ﴿کبر مقتا عند الله وعند الذین آمنوا﴾ ئەوموجادەلەیە هۆی ڕق و تاوان و کینەیەکی زۆر گەورەیە لەلای خواو، لای ئەوانەش بڕوایان هێناوە چونکە بێ

الجزء الرابع والعشرون — سورة غافر

ولقد جاءكم يوسف من قبل بالبينات فما زلتم في شك
مما جاءكم به حتى إذا هلك قلتم لن يبعث الله
من بعده رسولا كذلك يضل الله من هو مسرف
مرتاب ﴿٣٤﴾ الذين يجادلون في آيات الله بغير سلطان
أتاهم كبر مقتا عند الله وعند الذين آمنوا كذلك
يطبع الله على كل قلب متكبر جبار ﴿٣٥﴾ وقال فرعون
يا هامان ابن لي صرحا لعلي أبلغ الأسباب ﴿٣٦﴾ أسباب
السماوات فأطلع إلى إله موسى وإني لأظنه كاذبا
وكذلك زين لفرعون سوء عمله وصد عن السبيل
وما كيد فرعون إلا في تباب ﴿٣٧﴾ وقال الذي
آمن يا قوم اتبعون أهدكم سبيل الرشاد ﴿٣٨﴾
يا قوم إنما هذه الحياة الدنيا متاع وإن الآخرة هي
دار القرار ﴿٣٩﴾ من عمل سيئة فلا يجزى إلا مثلها
ومن عمل صالحا من ذكر أو أنثى وهو مؤمن
فأولئك يدخلون الجنة يرزقون فيها بغير حساب ﴿٤٠﴾

٤٧١

هیچ بەڵگەیەك قسە فڕێ ئەدەن ﴿كذلك يطبع الله على كل قلب متكبر جبار﴾ وەك ئەو مۆرنانە بەسەر ئالی فیرعەوندا,خوا مۆردەنێ بەسەر دڵی هەموو مرۆڤێكی لەخۆ بایی بو و ستەمكاردا.بەڵێ.. هەركاتێ دڵ فاسیدو وتێك چوو، ئەوا تەواوی لاشەو جەستەیش فاسید دەبێ و تێك دەچێ، وەك پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمووێ: ((ان فی الجسد مضغة اذا صلحت، صلح الجسد كله، واذا فسدت فسد الجسد كله الا وهی القلب)) متفق علیه.

**فیرعەون مەسخەرە بە پەروەردگاری مووسا دەكات:**

﴿[٣٦] وقال فرعون يا هامان ابن لى صرحا﴾ فیرعەون دوای وتەكانی پیاوە موسڵمانەكە ترسی لێ نیشت كەئەو قسانەی ئەوە تینیان تێ بكات، بۆیە ئەڵێ: باموسا تاقی بكەینەوە بزانین راسئەكات، جا لەبەر ئەوە وتی:ئەی هامان! كۆشكێكی‌بەرزم بۆ دروست بكە، لە جێگایەكە تردا دەفەرمووێ: (فأوقد لى يا هامان على الطين فاجعل لى صرحا..)٣٨/٢٨. ﴿لعلى أبلغ الأسباب.
[٣٧] أسباب السموات﴾ بەشكو بگەمە چەند رێبازەكان, رێبازەكانی سەركەوتن بۆ ئاسمانەكان!!.. ﴿فأطلع إلى إله موسى﴾ تا لەخوای موسا ئاگادار ببم و ببینم ,دیارە بە گاڵتەوە ئەڵێ (خوای موسا)، بۆیە وتی: ﴿وإنى لأظنه كاذبا﴾ هەرچەند من پێم وایە درۆ ئەكات كە ئەڵێ: خوایەكی تر هەیە! ﴿وكذلك زين لفرعون سوء عمله﴾ هەروەك ئەم رازاندنەوەیە كارە خراپەكان لای فیرعەون رازاوەو جوان كران! ﴿وصد عن السبيل﴾ و لەرێی راستیش بەرهەڵستی كرا, چونكە خۆی لارو شایستە بوو ﴿وماكيد فرعون إلا فى تباب﴾ بێگومان كارو نەخشەو فرت و فێڵی نادروستی فیرعەون بۆشاردنەوە ی راستیەكان, هەر لەزەرەرو زیانێكی گەورەدایە و, هیچ ئەنجامێكی چاكی نییە بۆی
﴿[٣٨] وقال الذى آمن يا قوم اتبعون أهدكم سبيل الرشاد﴾ جارێكی تر پیاوە باوڕدارەكەی (ئالی فیرعەون) دێتەوە وتاردان و ئەڵێ: قەوم و گەلەكەم! هەر بە شوێن مندا بێن! من رێنموونیتان دەكەم بۆ رێبازی دروست
﴿[٣٩] يا قوم إنما هذه الحياة الدنيا متاع﴾ ئەی هۆزەكەم! بەراستیی ژیانی ئەم دونیایە تەنها لەززەت بردنێكی بە پەلەیە ﴿وإن الآخرة هى دار القرار﴾ و بەراستیی تەنها ماڵەكەی تر (بەهەشت) جێی هەمیشەیی و ئیستیقرارە
﴿[٤٠] من عمل سيئة فلا يجزى إلا مثلها﴾ هەركەسێك خراپەیەكی كرد "لەدونیادا" هەر بەقەدەر ئەوە تۆڵەی لێ دەسنرێت ﴿ومن عمل صالحا من ذكر أو انثى﴾ ئەوەش چاكەیەكی كرد لە پیاو, یانلە ژن ﴿وهو مؤمن﴾ و لەهەمان كاتدا بڕواداریش بێت ﴿فأولئك يدخلون الجنة﴾ ئا ئەوانە دەچنە بەهەشتەوەو ﴿يرزقون فيها بغير حساب﴾ بێ ئەژمارو بێ سنوور لەوێدا رسق و رۆزیان ئەدرێتێ واتە: مەگەر تەنها خوا خۆی بزانێ چۆن پاداشتیان ئەداتەوە
﴿[٤١] ويا قوم ما لى ادعوكم إلى النجاة﴾ ئەی هۆزەكەم! چی هەیە بۆ ئێوە من بانگتان دەكەم بۆ رزگاریی "بەهەشت" ﴿وتدعوننى إلى النار﴾ ئێوەبانگی من دەكەن بۆ ئاگری

الجزء الرابع والعشرون — سورة غافر — الحزب ٤٨

۞ وَيَٰقَوْمِ مَا لِيٓ أَدْعُوكُمْ إِلَى ٱلنَّجَوٰةِ وَتَدْعُونَنِيٓ إِلَى
ٱلنَّارِ ﴿٤١﴾ تَدْعُونَنِي لِأَكْفُرَ بِٱللَّهِ وَأُشْرِكَ بِهِۦ مَا لَيْسَ
لِي بِهِۦ عِلْمٌ وَأَنَا۠ أَدْعُوكُمْ إِلَى ٱلْعَزِيزِ ٱلْغَفَّٰرِ ﴿٤٢﴾ لَا جَرَمَ
أَنَّمَا تَدْعُونَنِيٓ إِلَيْهِ لَيْسَ لَهُۥ دَعْوَةٌ فِي ٱلدُّنْيَا وَلَا فِي ٱلْءَاخِرَةِ
وَأَنَّ مَرَدَّنَآ إِلَى ٱللَّهِ وَأَنَّ ٱلْمُسْرِفِينَ هُمْ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ
﴿٤٣﴾ فَسَتَذْكُرُونَ مَآ أَقُولُ لَكُمْ وَأُفَوِّضُ أَمْرِيٓ إِلَى
ٱللَّهِ إِنَّ ٱللَّهَ بَصِيرٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴿٤٤﴾ فَوَقَىٰهُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِ
مَا مَكَرُوا۟ وَحَاقَ بِـَٔالِ فِرْعَوْنَ سُوٓءُ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٥﴾ ٱلنَّارُ
يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدْخِلُوٓا۟
ءَالَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٦﴾ وَإِذْ يَتَحَآجُّونَ فِي
ٱلنَّارِ فَيَقُولُ ٱلضُّعَفَٰٓؤُا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓا۟ إِنَّا كُنَّا
لَكُمْ تَبَعًا فَهَلْ أَنتُم مُّغْنُونَ عَنَّا نَصِيبًا مِّنَ ٱلنَّارِ
﴿٤٧﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓا۟ إِنَّا كُلٌّ فِيهَآ إِنَّ ٱللَّهَ
قَدْ حَكَمَ بَيْنَ ٱلْعِبَادِ ﴿٤٨﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ فِي ٱلنَّارِ لِخَزَنَةِ
جَهَنَّمَ ٱدْعُوا۟ رَبَّكُمْ يُخَفِّفْ عَنَّا يَوْمًا مِّنَ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٩﴾

قالوا أولم ٤٧٢

دۆزەخ؟! ﴿٤٢ تدعوننی لأکفر بالله﴾ ئێوە من بانگ دەکەن بێ باوەڕبم بە خوا ﴿واشرك به مالیس لی به علم﴾ وشتێك بکەمە شەریکی لە خوایەتیدا هیچ زانیارییەکم پێی نیە. ﴿وانا ادعوکم إلی العزیز الغفار﴾ لەکاتێکا من بانگتان دەکەم بۆ لای خوایەکی دەسەڵاتداری لێبوردە ﴿٤٣ لا جرم انما تدعوننی إلیه لیس له دعوة فی الدنیا ولا فی الآخرة﴾ راستە،کە ئەوە منی بۆ بانگ ئەکەن بیپەرستم, نە لەدونیاو، نە لە پاشە رۆژدا تەانای وەڵامدانەوەی دوعایەکی نیە ﴿وان مردنا إلی الله﴾ بە راستی گەڕانەوەمان هەر بۆ لای خوایە ﴿وان المسرفین هم أصحاب النار﴾ و بێگومان ئەوموشریکە لەسنوور دەرچووانە هاوەڵانی دۆزەخن ﴿٤٤ فستذکرون ما اقول لکم﴾ جا ئکاتێ سزاکە تان بینی, قسەی منتان وەبیر دێتەوە, بەڵام چ کەڵکێکی ئەبێ؟ ﴿وافوض امری إلی الله﴾ وەمن تەواوی کاروباری خۆم بەخوا ئەسپێرم, ئیتر چی ئەبێ با ببێ ﴿إن الله بصیر بالعباد﴾ بەراستیی خوا بە بەندەکانی بینایە ,ئەزانێ خەریکی چین ﴿٤٥ فوقاه الله سیئات ما مکروا﴾ ئینجا خوا ئیماندارەکەی پاراست لە فرت و فێڵیان ﴿وحاق بآل فرعون سوء العذاب﴾ ئەوسزا بەدوتوندەش دارو دەستەکەی فیرعەونی داگرت، واتە: لەدەریاکەدا نوقمکران ﴿٤٦ النار یعرضون علیها غدوا وعشیا﴾ لە سەر ئاگر رادەنوێنرێن بەبەیانی و نیوەڕۆ بەدواوە،ئەمەش هەر لەگۆڕەوە تا قیامەت: ((عن عائشة -رضی الله عنها-: أن یهودیة دخلت علیها فقالت: نعوذ بالله من عذاب القبر، فسألت عائشة رسول الله ﷺ عن عذاب القبر فقال ﷺ ((نعم عذاب القبر)) ئیمامی بوخاریی لە خاتوو عائیشەوە - خوای لێ رازی بێ- لەپێغەمبەری پرسی: دەربارەی سزای گۆڕ؟ ئەویش فەرمووی: بەڵێ سزای گۆڕ راستەو هەقە، ئیتر هەموو جارێك پاش نوێژەکان ((اللهم إنی أعوذ بك من عذاب القبر))ی دەوت. دەتوانی سەیرێکی (ئیبن کەسیر) بکەیت, چونکەفەرموودەیەکی زۆری هێناوە دەربارەی سزای گۆڕ. ﴿ویوم تقوم الساعة﴾ و رۆژێکیش قیامەت بەرپا دەبێت, خوا بە بەفریشتەکان دەفەرموێ: ﴿ادخلوا آل فرعون اشد العذاب﴾ ئال و شوێنکەوتوانی فیرعەون بخەنە ناو سەخترین سزاوە، ئەمەیە کە خوا نەناس و کافرو سوود وەردەگرێت لەکارو کردەوەی چاکی خۆی، لەدونیاو لەقیامەتدا! لەدونیادا خوا بەماڵ وسامان و کوڕو منداڵ و لەشساغیی و تەندروستیی پاداشتی دەداتەوە، لە قیامەتیشدا کەمتر لەو سزایەی (ئالی فیرعەون)ی هەیە ﴿٤٧ وإذ یتحاجون فی النار﴾ بۆیان باس بکە ئەی پێغەمبەر! کاتێ لەناو ئاگردا لەگەڵ یەکتر کێشمەکێشیانەو, یەکتر تاوانبارو گوناهبار ئەکەن: ﴿فیقول الضعفاء للذین استکبروا﴾ جالاوازو چەوساوەکان، (شوێنکەوتووە بێ دەسەڵاتکراوەکان) بە لەخۆبایی بووەکان (شەرۆکەکان) دەڵێن: ﴿إنا کنالکم تبعا﴾ بەراستی ئێمە شوێنکەوتووی ئێوە بووین ﴿فهل انتم مغنون عنا نصیبا من النار﴾ جائایا ئێستا ئەتوانن و دەسەڵاتتان هەیە بەشێك لەسزای ئەو ئاگرەمان لەکۆڵ بخەن؟ ﴿٤٨ قال الذین استکبروا إنا کل فیها﴾ سەرکردە دەماخبەرزەلەخۆبایی بووەکانیش ئەڵێن: بەراستی ئێمە هەموو لەناو ئاگردایـن, ئەگەر شتێکمان پێ کرابا، بۆخۆمانمان ئەکرد ﴿إن الله قد حکم بین العباد﴾ بەراستی خوا لەنێوان بەندەکانیدا بەدادگەرانە داوەریی کرد, لەبەر ئەوە هەموو بێ باوەڕبووین, بڕیاری داوە تۆڵەی خۆمان وەر ئەگرین، واتە: ئێمەی سەرکردەو ئێوەی چەوساوە هەر دوو لەناو ئاگرداین ﴿٤٩ وقال الذین فی النار لخزنة جهنم﴾ ئەوانەی لەنێو ئاگردان بە فریشتە دەرگاوانەکانی دۆزەخ ئەڵێن: ﴿ادعوا ربکم یخفف عنا یوماً من العذاب﴾ لەپەروەردگارتان بخوازن، کە تەنها رۆژێك سزای دۆزەخمان لێ سووك بکات ﴿٥٠ قالوا أو لم تك تأتیکم رسلکم بالبینات﴾ ئەوانیش لەوەڵامدا پێیان ئەڵێن: ئایا پەیامبەرە کانتان بەچەندین بەڵگەی ئاشکراوە نەهاتنە لاتان ,کەچی ئێوە هەر بڕواتان پێ نەکردن ﴿قالوا بلی﴾ لە وەڵامدا ئەڵێن: بەڵێ هاتنە لامان بە درۆزنمان

کردن ﴿قالوا فادعوا﴾ جا فریشتەکان ئەڵێن: دە داوا بکەن و بپاڕێنەوە لەخوا ،بەڕاستی ئێمە جورئەت ناکەین ﴿وما دعاء الكافرين إلا في ضلال﴾ داواو پاڕانەوەی بێ بڕوایانیش، هیچ کەڵکێك نابەخشێ و، هەر لە نابوودبووندایە.

**خوا یاریی پێغەمبەران و باوەرداران دەدات:**

﴿٥١ إنا لننصر رسلنا والذين آمنوا في الحياة الدنيا﴾ بێگومان ئێمە یارمەتی پەیامبەرانمان و ئەوانەش بڕوایان هێناوەئەدەین، لە ژیانی دونیادا بەسەر دوژمنانیانداسەریان ئەخەین، سەرخستنی پێغەمبەران و بڕواداران ئەوەیە:خوا هەمیشە کۆمەڵێ دەنێرێ بەرگری لە بەرنامەو ئایینەکەیان بکەن و تۆڵە لەستەمکاران بسێننەوە، بەتایبەت لەو دەمەی پێغەمبەردا ﷺ تا ئێستاش ئەو ڕاستیە دەبینرێ کە ئایینی خوا هەر دەمێنێ و هەر زاڵە، ئەگەرچی تاغووت و دونیا خۆرانیش فێڵ و فەرەج لێ بدەن!

﴿ويوم يقوم الأشهاد﴾ وە لەوڕۆژەیشدا کە شایەدان - لە پێغەمبەران و فریشتەو..- هەڵئەسن و ڕاست دەبنەوە بەشایەتیدان لەسەر ئەوانەی درۆیان لە سەر خواوەند کردبوو، وەك لە(هوود:١٨) ئەفەرموێ: (ويقول الأشهاد هؤلاء الذين كذبوا على ربهم..). ﴿٥٢ يوم لا ينفع الظالمين معذرتهم﴾ ئەو ڕۆژە کە بڕو بیانوو پاڕانەوەی ستەمکاران وەر ناگیرێ و، هیچ کەڵکێکیان پێ ناگەیەنێ ﴿ولهم العنة ولهم سوء الدار﴾ نەفرەت وخراپترین حاڵ و جێگەیان بۆ هەیە لە دۆزەخدا.

**مەسەلی موساو بەنی ئیسراویل وبەڵێنی سەرکەتن بە پێغەمبەر:**

﴿٥٣ ولقد آتينا موسى الهدى﴾ بێگومان ئێمە هۆی ڕێنموونیمان دابەمووسا "تەورات و چەندان ئایەت و مۆجیزە" هەر بەوەش سەرمان خست ﴿واورثنا بني إسرائيل الكتاب﴾ وەکتێبی تەوراتیشمان هێشتەوە لەناو کورانی یەعقوبداو، بوونە خاوەن هەقی ئەو نامەیە ﴿٥٤ هدى وذكرى لأولي الألباب﴾ بۆ ڕێنماو یادەوەری بۆ خاوەن ئاوازەکان ﴿٥٥ فاصبر إن وعد الله حق﴾ جا کەواتە ئەی موحەممەد ﷺ لەسەر ئەزیەت و ئازاریان ئارام بگرە، چونکە بەڵێنی خوا بەسەر خستنت ڕاستەو دێتەجێ ﴿واستغفر لذنبك﴾، وە بۆ گوناهانت داوای لێبوردن بکە لەو شتانەی کە ناتوانی وەك پێویست پێیان هەڵسیت، لەوانەیشە مەبەست فێر کردنی داخوازی ئوممەتەکەی بێت ﴿وسبح بحمد ربك بالعشي والإبكار﴾ وبە هەموو ئێوارەو بەیانیان سوپاس و تەسبیحاتی پەروەردگارت بکە , واتە:هەرگیز لە یادی خواوەند غافڵ مەبە ﴿٥٦ ان الذين يجادلون في آيات الله بغير سلطان اتاهم﴾ بەڕاستیی ئەوانەی لە ئایەتەکانی خوادا دەمبازی دەکەن, بەبێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەکیان بۆهاتبێ ﴿إن في صدروهم إلا كبر﴾ لە سینەکانیاندا خۆ بە زلزانین نەبێ بەرامبەر بە هەق , شتێ تر نییە و، ئەیانەوێ هەق باتڵ بکەنەوە ﴿ما هم ببالغيه﴾ هەرگیز ئەوان پێیشی ناگەن و ناتوانن نووری خوا

الجزء الرابع والعشرون — سورة غافر

قَالُوٓاْ أَوَلَمۡ تَكُ تَأۡتِيكُمۡ رُسُلُكُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِۖ قَالُواْ بَلَىٰۚ قَالُواْ فَٱدۡعُواْۗ وَمَا دُعَٰٓؤُاْ ٱلۡكَٰفِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَٰلٍ ﴿٥٠﴾ إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَيَوۡمَ يَقُومُ ٱلۡأَشۡهَٰدُ ﴿٥١﴾ يَوۡمَ لَا يَنفَعُ ٱلظَّٰلِمِينَ مَعۡذِرَتُهُمۡۖ وَلَهُمُ ٱللَّعۡنَةُ وَلَهُمۡ سُوٓءُ ٱلدَّارِ ﴿٥٢﴾ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡهُدَىٰ وَأَوۡرَثۡنَا بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱلۡكِتَٰبَ ﴿٥٣﴾ هُدٗى وَذِكۡرَىٰ لِأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿٥٤﴾ فَٱصۡبِرۡ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ بِٱلۡعَشِيِّ وَٱلۡإِبۡكَٰرِ ﴿٥٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ بِغَيۡرِ سُلۡطَٰنٍ أَتَىٰهُمۡ إِن فِي صُدُورِهِمۡ إِلَّا كِبۡرٞ مَّا هُم بِبَٰلِغِيهِۚ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ﴿٥٦﴾ لَخَلۡقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ أَكۡبَرُ مِنۡ خَلۡقِ ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٥٧﴾ وَمَا يَسۡتَوِي ٱلۡأَعۡمَىٰ وَٱلۡبَصِيرُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَلَا ٱلۡمُسِيٓءُۚ قَلِيلٗا مَّا تَتَذَكَّرُونَ ﴿٥٨﴾

٤٧٣

بکوژێننەوە ﴿فاستعذ بالله﴾ جا کەوابوو تۆپەنابەرە بەر خوا ﴿إنه هو السميع البصير﴾ چونکە بەراستی تەنها ئەوە بیسندەی بینا.

**ژینی دوای مردن:**

﴿٥٧ لخلق السموات والأرض اكبر من خلق الناس﴾ بەراستی دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی، لەدروستکردنی خەڵك دوای مردن گەورەترە. واتە: زاتێ کە ئاسمان و زەویی بەو هەموو شتە سەرسوڕهێنەرانەوە دروستکردبێ، ئەی چۆن ناتوانێ مرۆڤ پاش مردن زیندوو بکاتەوە؟! ﴿ولكن اكثر الناس لا يعلمون﴾ بەڵام زۆرترینی خەڵك نازانن و تێنا فکرێن لەو راستیە ﴿٥٨ وما يستوى الأعمى والبصير﴾ و مرۆڤی نابیناو مرۆڤی بینا وەکو یەك نین، واتە: مرۆی باوەڕدارو بێ باوەڕ چوونیەك نابن ﴿والذين آمنوا وعملوا الصالحات﴾ و نەئەوانەیش بڕوایان هێناوەو کارە چاکەکانیان کردووە ﴿ولا المسئ﴾ ونە خراپکاریش ﴿قليلا ما تذكرون﴾ ئەوانەتان بیر ئەکەنەوەو ئامۆژگاری وەر ئەگرن چەندە کەمن﴿٥٩ إن الساعة آتية لاريب فيها﴾ بەراستی رۆژی قیامەت هەردێ و هیچ گومانی تێدا نییە ﴿ولكن اكثر الناس لا يؤمنون﴾ بەڵام زۆرترینی مەردم بڕوا ناکەن بەهاتنەکەی! ﴿٦٠ وقال ربكم ادعوني استجب لكم﴾ و پەروەردگارتان فەرمووی:داوا لە من بکەن و لە من بپاڕێنەوە , منیش وەڵامتان دەدەمەوە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((إن الدعاء هو العبادة)) جا پاش ئەوە، ئایەتی (أدعوني استجب لكم)ی خوێندەوە. متفق عليه. یان دەفەرموێ: ئەوەی لە خوا ناپاڕێتەوە، خوا لێی توورەیە. ئیمام ئەحمەد و أصحاب السنن. ﴿إن الذين يستكبرون عن عبادتي﴾ بێگومان ئەوانەی خۆ بە گەورە دەزانن لە پەرستنم بە تەنیا ﴿فسيدخلون جهنم داخرين﴾ بێگومان بە سەرشۆڕی و بە بچووکی دەچنە دۆزەخەوە.

الجزء الرابع والعشرون — سورة غافر

إِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَأَتِيَةٌ لَّا رَيْبَ فِيهَا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ
لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٥٩﴾ وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدْعُونِيٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْ
إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ
دَاخِرِينَ ﴿٦٠﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ لِتَسْكُنُوا۟
فِيهِ وَٱلنَّهَارَ مُبْصِرًا إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ
وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ ﴿٦١﴾ ذَٰلِكُمُ
ٱللَّهُ رَبُّكُمْ خَٰلِقُ كُلِّ شَيْءٍ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ
﴿٦٢﴾ كَذَٰلِكَ يُؤْفَكُ ٱلَّذِينَ كَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ
﴿٦٣﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ قَرَارًا وَٱلسَّمَآءَ
بِنَآءً وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ وَرَزَقَكُم مِّنَ
ٱلطَّيِّبَٰتِ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ
ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٦٤﴾ هُوَ ٱلْحَيُّ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱدْعُوهُ
مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٦٥﴾ ۞ قُلْ
إِنِّي نُهِيتُ أَنْ أَعْبُدَ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَمَّا جَآءَنِيَ
ٱلْبَيِّنَٰتُ مِن رَّبِّي وَأُمِرْتُ أَنْ أُسْلِمَ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٦٦﴾

هو الذي — ٤٧٤

**بەم کارانە خوا بناسە:**

﴿٦١ الله الذى جعل لكم الليل لتسكنوا فيه﴾ خوایە ئەوی شەوی بەتاریك دروستکرد بۆتان , تا ئارامی تیا بگرن و تێیدا بحەوێنەوە ﴿والنهار مبصرا﴾ و رۆژیش بە رووناك و رۆشن , تارزق و رۆزی تیا بەدەست بێنن ﴿إن الله لذو فضل على الناس﴾ بەراستی خوا خاوەنی نیعمەت و بەهرەی زۆرە بەسەر خەڵکیەوە ﴿ولكن اكثر الناس لا يشكرون﴾ بەڵام زۆربەی خەڵك شوکری ناکەن وسپڵەن! ﴿٦٢ ذلكم الله ربكم خالق كل شئ﴾ ئائەو خوایەیە پەروەردگاری ئێوە، بەدیهێنەری هەمووشتێك ﴿لا إله إلا هو﴾ جگە لەویش هیچ پەرستراوێکی هەق نیە ﴿فأنى تؤفكون﴾ دە ئیتر چۆن لە یەکخواپەرستی لا ئەدرێن؟ ﴿٦٣ كذلك يؤفك الذين كانوا بآيات الله يجحدون﴾ هەرئا بەو جۆرەیە لە یەکخواپەرستی لا ئەدرێن ,ئەوانەش لەئایەتەکانی خوا حاشاو نکوڵی ئەکەن ﴿٦٤ الله الذى جعل لكم

﴿الأرض قرارا﴾ خوایە ئەوەی زەویی بۆ کردوون بارەگاو نشیمەن و نیشتگە ,تا تیایا بژین و بحەوێنەوە ﴿والسماء بناء﴾ و ئاسمانیش بە بیناکراو وەك گومەزیی لەسەرووتانەوە ﴿وصورکم فاحسن صورکم﴾ وێنەی کێشاون، جوان وێنەی کێشاون ,چونکە ئێوە لەهەموو گیانلەبەرێك بالاو بەژنتان جوانترە ﴿ورزقکم من الطیبات﴾ وە لە هەرچی حەلاڵ و پاکە رزقی پێداون، وەك لەم ئایەتەشدا دەفەرمووێ: (الذی جعل لکم الأرض فراشا والسماء بناء وانزل من السماء ماء فأخرج به من الثمرات رزقا لکم فلا تجعلوا لله أندادا وأنتم تعلمون)٢/٢٢. دوویاتی ئەو هەموو نیعمەتانە دەکاتەوە ﴿ذلکم الله ربکم﴾ ئا ئەوخوا(الله)یە یە پەروەردگارتان ﴿فتبارك الله رب العالمین﴾ گەورەیی و بڵندی بۆ خوای پەروەرد گاری جیهانەکان ﴿٦٥ هو الحی﴾ ئەوە هەمیشە زیندوو ﴿لا إله إلا هو﴾ لەغەیرەز ئەو هیچ پەرستراوێکی هەق نیە ﴿فادعوه مخلصین له الدین﴾ دەسا ئێوە هەر ئەو بپەرستن بەپوختی و بێخەوش لە شیرك ﴿الحمد لله رب العالمین﴾ سوپاس هەر بۆ خودای پەروەردگاری جیهانەکانە.

**هەرگیز رێ بە شیرك نەدراوە:**

﴿٦٦ قل إنی نهیت ان اعبد الذین تدعون من دون الله﴾ ئەی موحەممەد ﷺ پێیان بڵێ: بەراستی من قەدەغە کراوم لەپەرستنی ئەو شتانە، کە ئێوە لە باتی خوا هاواریان بۆ دەبەن و ئەیانپەرستن , کەوابوو ئێوەش واز لە بتپەرستنیان بێنن ﴿لما جاءنی البینات من ربی﴾ کاتێ بەڵگە روونەکان لە پەروەردگارمەوە بۆم هاتن , سەبارەت بەیەکتاپەرستی ﴿وامرت ان اسلم لرب العالمین﴾ و فەرمانم پێدراوە کە ملکەچ بم بۆپەروەرد گاری جیهانەکان ﴿٦٧ هوالذی خلقکم من تراب ثم من نطفة ثم من علقة﴾ هەرئەو خوا بەتوانایەیە ئەسڵتانی (ئادەم) لەگڵێك دروستکرد، لەپاشان لە تۆماوێکی ئاوی منی, ئینجا لەخوێنپارە (خوێنێکی جەڵتە) ﴿ثم یخرجکم طفلا﴾ لەپاشان لەسکی دایکتاندا بەساوایی

هُوَ ٱلَّذِی خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ يُخْرِجُكُمْ طِفْلًا ثُمَّ لِتَبْلُغُوٓا۟ أَشُدَّكُمْ ثُمَّ لِتَكُونُوا۟ شُيُوخًا ۚ وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ مِن قَبْلُ ۖ وَلِتَبْلُغُوٓا۟ أَجَلًا مُّسَمًّى وَلَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٦٧﴾ هُوَ ٱلَّذِی يُحْىِۦ وَيُمِيتُ ۖ فَإِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٦٨﴾ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِىٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ أَنَّىٰ يُصْرَفُونَ ﴿٦٩﴾ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِٱلْكِتَٰبِ وَبِمَآ أَرْسَلْنَا بِهِۦ رُسُلَنَا ۖ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٧٠﴾ إِذِ ٱلْأَغْلَٰلُ فِىٓ أَعْنَٰقِهِمْ وَٱلسَّلَٰسِلُ يُسْحَبُونَ ﴿٧١﴾ فِى ٱلْحَمِيمِ ثُمَّ فِى ٱلنَّارِ يُسْجَرُونَ ﴿٧٢﴾ ثُمَّ قِيلَ لَهُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ تُشْرِكُونَ ﴿٧٣﴾ مِن دُونِ ٱللَّهِ ۖ قَالُوا۟ ضَلُّوا۟ عَنَّا بَل لَّمْ نَكُن نَّدْعُوا۟ مِن قَبْلُ شَيْـًٔا ۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٧٤﴾ ذَٰلِكُم بِمَا كُنتُمْ تَفْرَحُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَبِمَا كُنتُمْ تَمْرَحُونَ ﴿٧٥﴾ ٱدْخُلُوٓا۟ أَبْوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۖ فَبِئْسَ مَثْوَى ٱلْمُتَكَبِّرِينَ ﴿٧٦﴾ فَٱصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ ۚ فَإِمَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ ٱلَّذِى نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِلَيْنَا يُرْجَعُونَ ﴿٧٧﴾

٤٧٥

دەتانهێنێتە دەر ﴿ثم لتبلغوا اشدکم﴾ لەپاشان تەمەنتان درێژ دەکرێ تا بگەنە تەمەنی کەماڵ و,پلەی زەبر و بەهێز بوون , تەمەنی چل ساڵی ﴿ثم لتکونوا شیوخا﴾ لەپاشان تەمەنتان درێژ دەکرێت تاپیر ببن ﴿ومنکم من یتوفی من قبل﴾ و تیاتانە پێش ئەوە بگاتە تەمەنی کەماڵ , یان پیریی ئەمرن ﴿ولتبلغوا اجلا مسمی﴾ خوا لە سەر ئەم شێوازە دروستیکردوون, تا بگەنە کاتێکی دیاریکراو بۆ مردن ﴿ولعلکم تعقلون﴾ بەشکم تێبگەن ئەوەی وا ئێوەی دروستکردووە, جگە لەو خوای تر نیە ﴿٦٨ هو الذی یحیی ویمیت﴾ هەر ئەو خوا بەتوانایەیە ژین دەداو دەیسێنێ,واتە: ژیان و، مردن،ئەو دروستیان ئەکات ﴿فإذا قضی امرا فإنما یقول له کن فیکون﴾ جا کاتی ویستی شتێك بەبوون بێنێ, تەنها ئەوەندەیە پێی ئەڵێ: ببە، ئەویش دەست بەجێ ئەبێ ,واتە: هیچ ئەزیەت و ماندوو بوونێکی تیا نیە بۆ ژیان پێبەخشین و مراندن.

**چارەنووسی کێشەکەران و دەمدرێژان:**

﴿٦٩ الم تر إلى الذين يجادلون في آيات الله﴾ ئایا ئەو چەواشە بووانەت نەدیوە کە لەبارەی ئایەتەکانی خواوە دەمە
دەمێ دەکەن؟! ﴿انى يصرفون﴾ چۆن لادەدرێن لێیان و، لەرێی راست و رەوا خۆ کلا دەکەن؟ ﴿٧٠ الذين كذبوا
بالكتاب وبما ارسلنا به رسلنا﴾ ئەوانەی بەم قورئانەو بەونیشانەو موعجیزانەش پەیامبەرەکانمان پێناردبوو
باوەڕیان نەکرد ﴿فسوف يعلمون﴾ جا لەئاییندەدا پاشەرۆژی خۆیان دەزانن، دەزانن جێ و رێیان دوزەخ و
واوەیلایە، وەك ئەفەرموێ: (ويل يومئذ للمكذبين)١٠/٨٣. ﴿٧١ إذ الأغلال في أعناقهم والسلاسل﴾ کاتێ کۆت و زنجیر
لە ملیاندایە ﴿يسحبون* ٧٢ في الحميم﴾ بەو زنجیرانە رائەکێشرێن، بە ناو ئاوێکی گەرمداو، دەشکرێ بەگەروویاندا،
وەك ئەم ئایەتەی (يطوفون بينها وبين حميم آن)٤٤/٥٥. وە ئایەتی: (ثم إنكم أيها الضالون المكذبون لأكلون من
شجر من زقوم /٥١/٥٦-٥٢) وە ئایەتی: (خذوه فاعتلوه إلى سواء الجحيم ثم صبوا فوق رأسه من عذاب الحميم، ذق
إنك انت العزيز الكريم) ٤٧/٤٤-٤٩. جەخت لەسەر ئەوماناو مەبەستە دەکەنەوە ﴿ثم في النار يسجرون﴾ لەپاشا
لەناو ئاگردا گڕ دەدرێن و ئەسووتێنرێن، هاوڕێ لەگەڵ تەواوی پێست و گۆشت و ئێسقانیان ﴿٧٣ ثم قيل لهم اين
ماكنتم تشركون* ٧٤ من دون الله﴾ لەپاشان پێیان ئەوترێ: کوان ئەو بتانەی کە ئێوە لەباتی خوا ئەتانپەرستن و،
ئەتانکردنە شەریك و هاوەڵی خوا؟ ﴿قالوا ضلوا عنا﴾ ئەڵێن: هەموو لەپێش چاومان ونبوون و ڕۆیشتن و تیاچوون
﴿بل لم نكن ندعو من قبل شيئا﴾ بەڵکو ئێمە لەپێشدا کە لەدونیادا بووین هیچ شتێکمان نەدەپەرست. وا ئەزانن
ئەگەر ئەو درۆیە بکەن، کەڵکی دەبێ بۆیان ﴿كذلك يضل الله الكافرين﴾ وەك ئەم گومڕا کردنەیە، خوا بێ بڕوایان
گومڕاو سەر لێشێواو دەکات ﴿٧٥ ذلكم بما كنتم تفرحون في الأرض بغير الحق﴾ ئەو سزایەش لەسەر ئەوەیە کە
ئێوە لەزەوییدا بەناهەق لە کاتی کردنی تاواندا دڵشادو خۆشحاڵ ئەبوون ﴿وبما كنتم تمرحون﴾ وەبە هۆی ئەوەی
ئێوە دەعیەو فیزو بایی‌بەهەواییتان دەنواندو، خەڵکێکتان بەکەم دائەنا و، هەردەم ناهەقیتان ئەکرد ﴿٧٦ ادخلوا ابواب
جهنم خالدين فيها﴾ دەفەرموون لەدەرگاکانی دۆزەخەوە بچنە ژوورەوە بەهەتا هەتایی لەوێدا قەتیس بن ﴿فبئس
مثوى المتكبرين﴾، جا چەندە خراپە جێ وشوێنی خۆ بە زلزانەکان.

**بەئارام بە، سەردەکەویی:**

﴿٧٧ فاصبر إن وعد الله حق﴾ سا ئارامت بێ ئەی موحەممەد ﷺ بەراستیی بەڵێنی خوابە سزادانی دوژمنانت
راستە ﴿فإما نرينك بعض الذى نعدهم﴾ جاهەندێ لەو سزایەی بەڵێنمان پێیاندابوو، یان نیشانتی دەدەین و
بەچاوی خۆت دەیبینی ﴿اونتوفينك﴾ یان پێش ئەوە دەتمرێنین ﴿فإلينا يرجعون﴾ جا لەهەردوو حاڵەتەکەدا هەر
بۆلای ئێمە دەگێڕدرێنەوە ﴿٧٨ ولقد ارسلنا رسلا من قبلك﴾ سوێند ئەخۆم کە بەڕاستی لەپێش تۆشدا
پەیامبەرێکی زۆرمان ناردوون، هەریەك بۆلای گەلی خۆی ﴿منهم من قصصنا عليك﴾ داستانی هێندێکیانمان
لەقورئاندا بۆ باس کردوویت، ئەوانەیش بیست و پێنج پێغەمبەرن ﴿ومنهم من لم نقصص عليك﴾ هەندێکیشیانمان
بۆباس نەکردوویت. پێشەوا (ئەحمەد) ئەم فەرموودەیە ئەهێنێ: جارێك لە پەیامبەر ﷺ دەپرسن: ئاخۆ ژمارەی
پێغەمبەران چەندە؟ ئەویش دەفەرموێ: (١٢٤٠٠٠) سەدو بیست و چوار هەزار پێغەمبەرن،(٣١٥)یان بەکتێب و
نامەوە رەوانە کراون و پێیان دەڵێن(روسول). ﴿وماكان لرسول ان يأتى بآية إلا بإذن الله﴾ وەبۆ هیچ پەیامبەرێك
نەبووە کە موعجیزەیەك بێنێ، بەفەرمانی خوا نەبێ ﴿فإذا جاء أمر الله قضى بالحق﴾ جاهەرکات فەرمانی خوا
هاتبێ بە سزا ، بە دادگەری بڕیاردراوە لە نێوانیاندا ﴿وخسر هنالك المبطلون﴾ لەو کاتەدا ناهەقکارەکان زیانمەند

و پەشیمان بوون، بەڵام پەشیمانی کەڵکی نەبووە بۆیان ﴿[٧٩] الله الذي جعل لكم الأنعام﴾ خوا هەر ئەو زاتەیە وشترگەلی بۆ ئێوە دروستکرد ﴿لتركبوا منها﴾ بۆ ئەوەی سواربن لەهەندێکیان ﴿ومنها تأكلون﴾ لەهەندێکیشیان بخۆن ﴿[٨٠] ولكم فيها منافع﴾ وەزیاد لەوەش کەڵکێکی زۆریان تێیە بۆتان: خوریی و، کورك و، موو، شیرو، کەرەو پەنیرو، رۆن و.. هتد ﴿ولتبلغوا عليها حاجة في صدوركم﴾ وە بۆ ئەوەی لە سەر پشتیان بگەنە ئەو مەبەستە لە دڵتاندایە، واتە خۆتان و بارەکانتان – بەتایبەتی لەکاتی بازرگانییدا– بۆ هەڵگرن. ﴿وعليها وعلى الفلك تحملون﴾ لەسەر ئەو وشترانەو لە سەر کەشتیەکان هەڵدەگیرێن وهاتووچۆ دەکەن ﴿[٨١] ويريكم آياته﴾ ئەو زاتە بەڵگەو نیشانەکانی دەسەڵاتی خۆیتان نیشان ئەدات ﴿فأي ايات الله تنكرون﴾ جا ئینکاری کام لەنیشانە کانی خوا ئەکەن، لەگەڵ ئەوەدا کە زۆر ئاشکراو روونن؟!

الجزء الرابع والعشرون — سورة غافر

وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ مِنْهُم مَّن قَصَصْنَا عَلَيْكَ
وَمِنْهُم مَّن لَّمْ نَقْصُصْ عَلَيْكَ وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأْتِيَ
بِآيَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ فَإِذَا جَاءَ أَمْرُ اللَّهِ قُضِيَ بِالْحَقِّ وَخَسِرَ
هُنَالِكَ الْمُبْطِلُونَ ﴿٧٨﴾ اللَّهُ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَنْعَامَ
لِتَرْكَبُوا مِنْهَا وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٧٩﴾ وَلَكُمْ فِيهَا
مَنَافِعُ وَلِتَبْلُغُوا عَلَيْهَا حَاجَةً فِي صُدُورِكُمْ وَعَلَيْهَا وَعَلَى
الْفُلْكِ تُحْمَلُونَ ﴿٨٠﴾ وَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ فَأَيَّ آيَاتِ
اللَّهِ تُنكِرُونَ ﴿٨١﴾ أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ
كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ كَانُوا أَكْثَرَ مِنْهُمْ وَأَشَدَّ
قُوَّةً وَآثَارًا فِي الْأَرْضِ فَمَا أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ
﴿٨٢﴾ فَلَمَّا جَاءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ فَرِحُوا بِمَا عِندَهُم
مِّنَ الْعِلْمِ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ ﴿٨٣﴾ فَلَمَّا
رَأَوْا بَأْسَنَا قَالُوا آمَنَّا بِاللَّهِ وَحْدَهُ وَكَفَرْنَا بِمَا كُنَّا بِهِ
مُشْرِكِينَ ﴿٨٤﴾ فَلَمْ يَكُ يَنفَعُهُمْ إِيمَانُهُمْ لَمَّا رَأَوْا بَأْسَنَا سُنَّتَ
اللَّهِ الَّتِي قَدْ خَلَتْ فِي عِبَادِهِ وَخَسِرَ هُنَالِكَ الْكَافِرُونَ ﴿٨٥﴾

سورة فصلت — ٤٧٦

## لە پێشینان عیبرەت گرن:

﴿[٨٢] أفلم يسيروا في الارض﴾ ئایا ئەوانە بە رووی زەویدا نەڕۆیشتوون ﴿فينظروا كيف كان عاقبة الذين من قبلهم﴾ تا ببینن ئەنجامی ئەوانەی کە لەپێش ئەوانەوەبوون چۆن بوو؟ ﴿كانوا اكثر منهم واشد قوة وآثارا في الارض﴾ ئەوان لەمان لە رووی ژمارەوە زۆرترو، لە رووی هێزو شوێنەوارو بیناسازی و..هتد بەهێزتربوون ﴿فما اغنى عنهم ما كانوا يكسبون﴾ جا ماڵ وهێزو دەسەڵاتیان ،بێ نیازی نەکردن لە سزای خوا کاتێ بۆیان هات ﴿٨٣ فلما جاءتهم رسلهم بالبينات﴾ جاکاتێ پەیامبەرەکانیان بە بەڵگەی ئاشکراوەهاتنە لایان ﴿فرحوا بما عندهم من العلم﴾ کەچی لە باتی باوەڕهێنانیان،ئەوان بەو ئەندازە زانیارییەکەمەی خۆیان خۆشحاڵ بوون ،هەرچەندە رێگەیان پێ دەرنەئەکرد ﴿وحاق بهم ما كانوا به يستهزئون﴾ و ئەو سزایەی ئەوان گاڵتەیان پێ ئەکرد هاتە سەریان و دەورەیدان ﴿[٨٤] فلما راوا بأسنا﴾ ئینجا کاتێ سزا وتۆڵەی توندی ئێمەیان دی ودڵنیا بوون کە رزگرنابن ﴿قالوا امنا بالله وحده﴾ وتیان: وا ئێستا بڕوامان بە خوای تاك و تەنیا هێنا بە تەنیا ﴿وكفرنا بما كنا به مشركين﴾ باوەڕیشمان نەمابەو بتانەی کە پێشتر کردبوومانن بە شەریك و هاوەڵی خوا ﴿[٨٥] فلم يك ينفعهم إيمانهم لما راوا بأسنا﴾ ئینجائیمانەکەیان سوودی پێنەدان ، کاتێ سزاکەی ئێمە یان دی، چونکە کار لە کار ترازا بووو، ئیتر لەو کاتەیشدا دەرگای پەشیمانی دادەخرێ (وەك فیرعەون کاتێك کە سزای دیت پەشیمان بوویەوەو وتی: (آمنت أنه لا إله إلا الذي آمنت به بنو إسرائيل وأنا من المسلمين) ١٠/٩٠. بەڵام وەك ئەم فەرمووده دەفەرموێ: ((إن الله تعالى يقبل توبه العبد مالم يغرغر))، مسند أحمد ١٣٢/٢، الترمذي، ابن ماجه). واتە: خوا تەوبە و پەشیمانی بەندە وەر ئەگرێ، پێش ئەوەی بگاتە حاڵەتی غەرغەرەو گیانەڵا. (سنة الله التي قد خلت في عباده) ئەمە ئەوسوننەت و باوەی خوابوو کەلە بەندەکانیدا تێپەڕی، واتە: بەدەرێژایی رۆژگار خوا سوننەتی وابووە، هەر

ق،ومێك له كاتی دیتنی سزادا باوەڕی هێنابێ لێی وەر نەگیراوەو سوودی نەبووە بۆی ﴿وخسر هنالك الكفرون﴾
لە،وكاتەدا كافرەكان زیانمەندبوون، چونكە ئاشكرا بوو وزانرا كە سوودیان لە هیچ شتێ وەرنەگرت، نەلەبتەكان،
نە،لە ئەو هەموو پیلانەیان.

له (١٩ی ربیع الثانی /١٤١٧/ك بەرامبەر ٢/٩/١٩٩٦ز دوای نوێژی بەیانی، لەنووسینی تەفسیری ئەم سورەتی (غافر)ە بوومەوە. لە (ڕاگەیاندنی بزووتنەوەی ئیسلامیی)، لە هەڵەبجەی شەهید.

زۆریش سوپاس بۆ خوای میهرەبان و غافیر, وە لەپەنای ئەم سووره تەدا , داوای لێخۆشبوونی لێدەكەین.

*** *** ***


الجزء الرابع والعشرون — سورة فصلت

سُورَةُ فُصِّلَتْ — مكية — آياتها ٥٤ — ترتيبها ٤١

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

حمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلٌ مِّنَ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴿٢﴾ كِتَٰبٌ فُصِّلَتْ
ءَايَٰتُهُۥ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٣﴾ بَشِيرًا وَنَذِيرًا فَأَعْرَضَ
أَكْثَرُهُمْ فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ ﴿٤﴾ وَقَالُوا۟ قُلُوبُنَا فِىٓ أَكِنَّةٍ
مِّمَّا تَدْعُونَآ إِلَيْهِ وَفِىٓ ءَاذَانِنَا وَقْرٌ وَمِنۢ بَيْنِنَا وَبَيْنِكَ حِجَابٌ
فَٱعْمَلْ إِنَّنَا عَٰمِلُونَ ﴿٥﴾ قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ
أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ فَٱسْتَقِيمُوٓا۟ إِلَيْهِ وَٱسْتَغْفِرُوهُ وَوَيْلٌ
لِّلْمُشْرِكِينَ ﴿٦﴾ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم بِٱلْءَاخِرَةِ
هُمْ كَٰفِرُونَ ﴿٧﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمْ
أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ ﴿٨﴾ ۞ قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِٱلَّذِى خَلَقَ
ٱلْأَرْضَ فِى يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُۥٓ أَندَادًا ذَٰلِكَ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٩﴾
وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِىَ مِن فَوْقِهَا وَبَٰرَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَآ أَقْوَٰتَهَا فِىٓ
أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ سَوَآءً لِّلسَّآئِلِينَ ﴿١٠﴾ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِىَ دُخَانٌ
فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ٱئْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَآ أَتَيْنَا طَآئِعِينَ ﴿١١﴾

٤٧٧

## ٤١- سوورەتی ( فوصیلەت )ـە مەككەییەو ( ٥٤ )ئایەتە.

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتە باسی یەكتاپەرستیی و پەیام و زیندووبوونەوەو پاداشت و تۆڵە دەكات، جا بۆیەكەمجار باسێكی گەورەتی قورئان ئەكات، كە چۆن بەو هەموو بەڵگانەوە دائەبەزێ و راستیی پەیامبەریش ﷺ ئەچەسپێنێ، هەروەك باسێكیسروش و نیگا بۆ پەیامبەر ئەكا,و,دەڵێ: موحەممەدی پێغەمبەر ﷺ مرۆڤێكەو، خوا لەناو مەردمدا هەڵیبژاردووە,هەتائەو پەیامە گەورەیەی هەڵگرێ و,بە جیهانیانی رابگەیەنێ، پاش ئەوەش باسی ئاسمانەكان و زەوی ئەكات، بۆ ئەوە بەوردی بیریان لێ بكرێتەوە و، بكرێنە بەڵگە بۆ یەكناسینی خوا، هەروەك پەنجە رائە كێشێ بۆ ئەنجامی ئەوانەی ململانێیان لەگەڵ پەیامبە راندا دەكرد، دوای ئەوەی كەباسی بڕواداران دەكات، بەتایبەت ئەوانەی كە خۆیان یەكلا كردووەتەوەو لەسەر نەخشەی خوا هەرگیز ناترازێن.. كۆتاییشی دێت بەباسی هەندێ لەنهێنییەكانی بوونەوەر، كەڕۆژ بەڕۆژ دەریان ئەخات بۆ ادەمزاد. جابەم شێوەیەش دەست پێدەكات: ﴿بسم الله الرحمن الرحيم* [1]
حم﴾ ئەم پیتانە هەر ئەوانەن كە قورئانیان لێ پێكهاتووە،دەسا ئەگەر ئێوەدەتوانن وێنەی ئەم قورئانە بێنن, بیهێنن!
﴿[2] تنز يل من الرحمن الرحيم﴾ ئەم قورئانە لەلایەن خوایەكی خاوەن بەزەییومیهرەبانەوە نێردراوەتە خوارەوە، وەك لە جێگایەكیتردا لەو بارەیەوە ئەفەرموێ: (قل نزله روح القدس من ربك بالحق) ١٦ /١٠٢.

### قورئان هەموو ئایەتەكانی شیكراونەتەوە:

﴿[3] كتاب فصلت آياته﴾ ئەم نامەیە كە ئایەت و مەبەستەكانی جوداكراونەتەوە لە یەكتر بەلەفزو بەمانا ﴿قرآنا عربيا﴾ خوێنراوەیەكە بە زمانی عەرەبی ﴿لقوم يعلمون﴾ بۆ خەڵكانێ ئەمە بزانن و دانابن و، بیانەوێ تێبگەن لەوانەی عەرەبیزانن ﴿[4] بشيرا ونذيرا﴾ مژدە بەخشە بە موسڵمانان بە بەهەشت, بۆ كافرانییش ترسێنەرە بە

دۆزەخ ﴿فأعرض اكثرهم﴾ جا لەگەڵ ئەوەیشدا زۆرترینیان لە باتی بڕوا هێنان، ڕوویان لێ وەر گێڕاوخۆیان لێبوارد، ﴿فهم لا يسمعون﴾ جا ئیدی نابیستن بەبیستنی تێرامان و گوێڕایەڵی،جاکەوابووئەم قورئانە هموو مەبە ستێکی مرۆڤی تیا ڕۆشن کراوەتەوە، ئەگەرخۆیان ئامادە بن و گوێ بگرن بۆی ﴿٥ وقالوا قلوبنا فى اكنة مما تدعونا اليه﴾ کاتێ‌پەیامبەر ﷺ بانگیکردن بۆ بڕواهێنان گوتیان:دڵەکانمان لە چەند بەرگێکدان سەبارەت بەوەی بانگمان ئەکەیت بۆلای لە یەکخواناسی، دڵمان پەردەی لەسەرەو داپۆشراوەو هیچی ناگاتێ ﴿وفي آذاننا وقر﴾ وگریدانیەك لە گوێکانماندایە ﴿ومن بيننا وبينك حجاب﴾و پەردەیەك لەنێوان ئێمە وتۆدایە، واتە:کێشەیەك لە نێوانماندایە ناهێڵێ بگەین بەیەکتر ﴿فاعمل إننا عاملون﴾دەسا تۆ کار بکە لە سەر ئایینی خۆت و ئێمەیش لە سەر ئایینی خۆمان کار دەکەین، جابابزانین کێ ڕاستەو ئەیباتەوەو،کێش ناراستەوئەیدۆڕێنێ.

**خەڵکی بانگ بکە بۆ پەرستنی خوا بە تاك و تەنیایی:**

﴿٦ قل إنما انا بشر مثلكم﴾ بڵێ: بەڕاستی منیش مرۆڤێکم وەکو ئێوە، فریشتە نیم ﴿يوحى إلى﴾ سرووشت و وەحیم بۆ ئەکرێ ﴿ا نما إلهكم إله واحد﴾ کە هەرپەرستراوی ڕاستە قینەی ئێوە، تە نها یەکخوایە و شەریك و هاوەڵی نیە ﴿فا ستقيموا إليه واستغفر وه﴾دەسا خۆتان ڕاست بکەنەوە بۆی و داوای بووراني گوناهەکانتانی لێ بکەن ﴿وويل للمشر كين﴾ هاوارو واوەیلا بۆ هاوبەشدانەران ﴿٧ الذين لا يؤتون الزكاة﴾ ئەوانەی زەکات نادەن و دەست گرۆیی هەژاران ناکەن،بەڵێ ئەم تەفسیرەیە، ڕای زۆرێکی ڕاڤەکەرانی قو رئانی لەسەرە، بەتایبەت (ئیبنی جەریر)، ئەگەرچی (ئیبن عەباس) دەڵێ: (الذين لا يؤتون الزكاة) مەبەست پێی‌ئەوانەن دڵ و دەروونیان لەشیرك پاك ناکەنەوەو بەڕاستی وشەی (لا إله إلا الله) ناڵێن، وەك دەفەرمووێ: (فقل هل لك الى إن تزكى)١٨/٧٩. ﴿وهم بالآخرة هم كافرون﴾ بە پاشە ڕۆژیش کافرو بێ باوەڕن ﴿٨ إن الذين آمنوا وعملوا الصالحات﴾ بەڕاستیی ئەوانەی بڕوایان هێناوەو،کارە چاکەکانیان کردووە ﴿لهم اجر غير ممنون﴾ پاداشتێکی بێ کۆتایی و نەبڕاوەیان بۆ هەیە.

**باسێکی دروستکردنی بوونەوەر:**

﴿٩ قل ائنكم لتكفرون بالذى خلق الأرض فى يومين﴾ پێیان بڵێ: ئایا باوەڕبەوزاتە ناکەن کە لەماوەی دوو ڕۆژدا (دوو دەورە ی ئەو چوارو ڕۆژە)زەویی و تەواوی شتە نهێنیەکانی زەویی دروستکرد ﴿وتجعلون له اندادا﴾ و هێمان وێنەو نموونەو هاوبەشی بۆ پەیدا دەکەن و، دەسەڵاتی ئەدەنە دەست؟ ﴿ذلك رب العالمين﴾ ئائەو بەدیهێنەرەیە پەروەردگاری جیهانەکان ،نەك ئەو بتانە ئێوە هەڵتان بژاردوون ﴿١٠ وجعل فيها رواسى من فوقها﴾ و چەند کەژو کێوێکی تابتی مەحکەمی بڵندیلە سەر زەوییدانا و،کردنی بەمێخ بۆی، تا ئێوەهەڵ نەدێرێ و،بە ئاسانی لەسەرپشتی بژین ﴿وبارك فيها﴾ و خێرو بیرێکی زۆری تێخست:ئاوو هەواو جۆرەها میوەو میوەجات و دەریاو کانگەکان و..هتد ﴿وقدر فيها اقواتها فى اربعة ايام سواء﴾ ڕۆزی و بژێوی خەڵکەکەی تیا دیارکرد هەر لەوچوار ڕۆژانەدا (چوار دەوران) واتە: ئەنجامدانی ئەوهەموو کارانە، تەنها لەماوەی دوو خولدا بوو، دروستکردنی زەویی و قایمکردنی کێوەکانیش خولێك بوو، ئەو هەموو خێرو خێراتەیش لەخولەکەی تردا، ئەوەهەر چوارخول و ڕۆژەکە بەیەکسانی ﴿للسائلين﴾ بۆ ئەوانەی پرسیار دەکەن:زەوی لە چەند ڕۆژدا دروستکراوە؟ دەگوترێ لە چوار ڕۆژاندا ﴿١١ ثم استوى إلى السماء وهى دخان﴾ پاش دروستکردنی زەویی، ئیرادەی دروستکردنی ئاسمانیشی کرد کە وەك دووکەڵێ وابوو. (ئیبن کەسیر) ئەڵێت: کاتێ زەویی دروست بوو، جۆرە هەڵمێك کە ئەمڕۆ پێی ئەڵێن: دونیای سەدیم وەك هەورلای سەرووی گرتبوو، جا لێرەدا هەڵئەگرێ زەوی لەپێش ئاسمانەوە دروست بووبێ،

ئەلێش ئەگرێ ئاسمان بەر لە زەویی دروستبووبێت، بەلاَم سوورەتی (نازعات) ئەمە روون ئەکاتەوە، جگە لەوەیش زانیاریی ئەمڕۆ پشتگیری ئەوەی کردووە کە زەویی پاش دروست بوونی ئاسمان بووە: وەك ئەفەرموێ: ﴿فقال لها وللأرض ائتیا طوعا أو کرها﴾ ئینجا خوا بەئاسمان و بەزەویی فەرموو: بێن و شکڵی خۆتان بگرن و، ملکەچ بن، چ بەزۆر چ بەئارەزوو ، چونکە بڕیار دراوە کە دەبێ دروست ببن ﴿قالتا اتینا طائعین﴾ ئەوانیش وتیان: وابەخۆشی و ملکەچ بوون، هاتین و شکڵی خۆمانمان وەرگرت ﴿[12] فقضاهن سبع سموات فی یومین﴾ جاحەوت ئاسمانی لە ماوەی دوو رۆژدا -جگە لەچوار رۆژەکەی تر- بەتەواوی دروستکرد ﴿واوحی فی کل السماء أمرها﴾ و لەهەر ئاسمانێك چی ئەویست بڕیاری بۆدا. کەوابوو ئاسمان و زەویی، هەردوو پێکەوە لەماوەی (٦)رۆژدا دروستکراون، (واتە:رۆژی یەك شەممە، بۆ رۆژی هەینی)، شیاوی باسە، لەچەند سورەتێکی قورئانیشدا ئەو (رۆژ)ـە باس کراوە، بۆ نموونە لەسوورەتی حەجدا، ئایەتی (٤٧) ئەفەرمووێ: (وإن یوما عند ربك كألف سنة مما تعدون) وە لەسوورەتی السجدة/٥ دا ئەفەرمووێ: (ثم یعرج إلیه في یوم كان مقداره ألف سنة مما تعدون)وە لەالمعارج/٤دا ئەفەرمووێ(تعرج الملائكة والروح إلیه في یوم كان مقداره خمسین لفی سنة). گومان نیە لەوەدا کە دیاریکردنی کات و زەمەن وزەمان، بەرۆژو ساڵ و مانگ: بەو پێیە کە ئێستا مرۆڤ لەسەر ئەم زەویە دەژی، وە سوڕانەوەی زەوی بەدەوری خۆردا، ئەگینا ئەگەر بڕۆیت بۆ ئەستێرەیەکی تری ئاسمان، ئەوا رێژەی درێژیی و کورتی رۆژەکە دەگۆڕ درێ. ساڵی ئێمە لەو زەوییەدا چونکە دوورین لە خۆرەوە، بە (٣٦٥) رۆژ ئەوجا بەرخەیەك بەدەوری خۆردا تەواو ئەکات، کەچی ئەستێرەی عەتارید بە (٨٨) رۆژ ساڵی خۆی تەواو ئەکات و ئەسوڕێتەوە بە دەوری خۆردا، بەلاَم ئەستێرەی (بلۆتۆ) چونکە دوور ترە لەخۆرەوە بە (٢٥٠، ٩٠) رۆژ ساڵی خۆی تەواو ئەکات واتە: ساڵێکی ئەو (٢٥٠) ساڵی ئێمەیە. ﴿وزینا السماء الدنیا بمصابیح﴾ و نزیکترین ئاسمانیشمان بەچەندین چرا (ئەستێرە) رازاندەوەبۆتان ﴿وحفظا﴾و بەپاراستن پاراستمان لە گوێڕاگرتنی شەیاتین بۆ(الملأ الأعلی) لەوە کە نهێنیەکانیان بدزن و، لەزەوییدا خەڵکی پێ فریوبدەن ﴿ذلك تقدیر العزیز العلیم﴾ ئەوکارە سەرسوڕهێنەرانە,گشت ئەندازە گرتنی خوای بەدەسەلاَتی زانایە.



فَقَضَىٰهُنَّ سَبۡعَ سَمَٰوَاتٖ فِي يَوۡمَيۡنِ وَأَوۡحَىٰ فِي كُلِّ سَمَآءٍ أَمۡرَهَاۚ
وَزَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا بِمَصَٰبِيحَ وَحِفۡظٗاۚ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ
ٱلۡعَلِيمِ ﴿١٢﴾ فَإِنۡ أَعۡرَضُواْ فَقُلۡ أَنذَرۡتُكُمۡ صَٰعِقَةٗ مِّثۡلَ صَٰعِقَةِ
عَادٖ وَثَمُودَ ﴿١٣﴾ إِذۡ جَآءَتۡهُمُ ٱلرُّسُلُ مِنۢ بَيۡنِ أَيۡدِيهِمۡ وَمِنۡ
خَلۡفِهِمۡ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّا ٱللَّهَۖ قَالُواْ لَوۡ شَآءَ رَبُّنَا لَأَنزَلَ مَلَٰٓئِكَةٗ
فَإِنَّا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿١٤﴾ فَأَمَّا عَادٞ فَٱسۡتَكۡبَرُواْ فِي
ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَقَالُواْ مَنۡ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةًۖ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّ ٱللَّهَ
ٱلَّذِي خَلَقَهُمۡ هُوَ أَشَدُّ مِنۡهُمۡ قُوَّةٗۖ وَكَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَجۡحَدُونَ
﴿١٥﴾ فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ رِيحٗا صَرۡصَرٗا فِيٓ أَيَّامٖ نَّحِسَاتٖ لِّنُذِيقَهُمۡ
عَذَابَ ٱلۡخِزۡيِ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَعَذَابُ ٱلۡأٓخِرَةِ أَخۡزَىٰۖ وَهُمۡ
لَا يُنصَرُونَ ﴿١٦﴾ وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيۡنَٰهُمۡ فَٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡعَمَىٰ عَلَى
ٱلۡهُدَىٰ فَأَخَذَتۡهُمۡ صَٰعِقَةُ ٱلۡعَذَابِ ٱلۡهُونِ بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ
﴿١٧﴾ وَنَجَّيۡنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ﴿١٨﴾ وَيَوۡمَ يُحۡشَرُ
أَعۡدَآءُ ٱللَّهِ إِلَى ٱلنَّارِ فَهُمۡ يُوزَعُونَ ﴿١٩﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا مَا جَآءُوهَا شَهِدَ
عَلَيۡهِمۡ سَمۡعُهُمۡ وَأَبۡصَٰرُهُمۡ وَجُلُودُهُم بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٢٠﴾



**لە سەرگوزشتەكەی ( عاد ) پەند وەربگرن:**

﴿[13] فإن اعرضوا﴾ ئینجا ئەگەر لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگانەدا, هێمان قورەیش روویان وەرگێڕا لە باوەڕ هێنان ﴿فقل انذرتكم صاعقة مثل صاعقة عاد وثمود﴾ پێیان بڵێ: بەهەورە تریشقەیەك، وەك هەورە تریشقەكەی گەلی عادو سەموود دەتانترسێنم ﴿[14] إذ جاءتهم الرسل من بین أیدیهم ومن خلفهم﴾ ئەوساتە كە پەیامبەرەكان هاتن بۆ

لایان له پێشیان و له پاشیاندا و، هەوڵێکی زۆریان لەگەڵدان, بەڵام هیچ کەڵکێکی نەبوو! وەك له جێگایەکی تردا ئەفەرموێ: (وقد خلت النذر من بين يديه ومن خلفه..)٢١/٤٦. ﴿الا تعبدوا إلا الله﴾ پێیان وتن: کە جگە لەخوا (اللـه)هـیچ کەسێك مەپەرستن ﴿قالوا لو شاء ربنا لأنزل ملائكة﴾ کەچی وتیان: ئەگەر پەروەردگارمان بیسویستبا پەیامبەرێك بنێرێ، ئەوا فریشتەی ئەنارد ,نەك ئادەمیی ﴿فإنا بما أرسلتم به كافرون﴾ بێگومان جائێمە، باوەڕمان نیە بەوەی ئێوەی پێ نێردراوە ﴿[15] فأما عاد فاستكبروا فى الأرض بغير الحق﴾ ئینجا عاد "گەلی هود" بەناڕەوا لەسەر زەویدا لەخۆبایی بوون و سەرپێچییان کردو یاخیی بوون، ئازاری هودو بڕوادارانیان دا! ﴿وقالوا من اشد قوة﴾ گوتیان: کێ لەئێمە بەهێزترە ,تا بتوانێ سزامان بدات؟! ﴿أو لم يروا أن الله الذى خلقهم هو أشد منهم قوة﴾ ئەی ئایانەیانزانیوە کە ئەو خوایە وا ئەوانی دروستکردووە, لەوان بەهێزترە؟ ﴿وكانوا بآياتنا يجحدون﴾. دیارە بە ئایەتەکانیئێمە نکووڵی و حاشایان کردد!! ﴿[16] فأرسلنا عليهم ريحا صرصرا﴾ جائێمەش (با)یەکی توندی بەدەنگمان ناردە سەریان کە: هەر بەشریخەو دەنگەکەی زۆربەیان مردن ﴿فى أيام نحسات﴾ لەچەند رۆژێکی تووش و شوومدا، وەك ئەم ئایەتەیش دەفەرمووێ: (فی يوم نحس مستمر)١٩/٥٤. یان لە جێگایەکی تردا دەفەرمووێ: ﴿سبع ليال وثمانية أيام حسوما..﴾ ٧/٦٩. ﴿لنذيقهم عذاب الخزى فى الحياة الدنيا﴾ تاهەر لەم ژیانیدنیایەدا سزایەکی ئابڕووبەریان پێ بچێژین ﴿ولعذاب الآخرة أخزى﴾ بێگومان سزای پاشە رۆژیش سەختترو ئابڕووبەرترە ﴿وهم لا ينصرون﴾ و یارمەتیش نادرێن بۆ رزگار بوونیان.﴿[17] وأما ثمود فهديناهم﴾ گەلی (سەموود)یش رێگەی خەیرو رێگەی شەڕمان نیشاندان ,راستیمان بۆ رۆشنکردنەوەو (صالح) پەیامبەرمان ﷺ بۆ ناردن ﴿فاستحبوا العمى على الهدى﴾ کەچی گومڕاییيان بەسەر هیدایەتدا هەڵبژارد! ﴿فأخذتهم صاعقة العذاب الهون بما كانوا يكسبون﴾ جا بەهۆی ئەو کارەیانەوە دەیانکرد ,هەورە تریشقەی سزای سووککەر گرتنیلەناوچوون ﴿[18] ونجينا الذين آمنوا وكانوا يتقون﴾ ئەوانەش کە بڕوایان هێناو لەسنوورەکانی خواخۆپارێزبوون، رزگارمانکردن.

**تێبینی:** گەلی سەمود لە (وادی القری)ی نێوان مەدینەو شامدا ئەژیان، خوا ئەرزو ئاوێکی زۆر پڕلەخێرو پڕ پیتی پێبەخشیبوون، وە خاوەنی کشتوکاڵ و باخ و باخاتێکی سەرسوڕهێنەر بوون، تەمەنێکی درێژیان بەسەر ئەبرد، لەش و قەبارەیەکی توندو بەهێزیان بوو، دەستێکی باڵایان لە داڕشتنی بیناو خانوو بەرەو کۆشك و تەلاردا هەبوو.

**ئەندامەکانی لەش, شایەتی دەدەن لە سەر خاوەنەکەیان:**

﴿[19] ويوم يحشر أعداء الله إلى النار﴾ ئەی موحەممەد ﷺ باسی ئەو رۆژە بکە بۆ گەلەکەت کە نەیارو دوژمنانی خوا بەرەو ئاگری دۆزەخ کۆ ئەکرێنەوە ﴿فهم يوزعون﴾ جابەڕیز رائەگیردرێن و دەستە دەستە بەرێدەکرێن بۆئاگر. واتە: هەموویێکەوە ریز دەکرێن وئەیانبەن بۆ مەحشەر ﴿[20] حتى إذا ماجاؤها شهد عليهم سمعهم وأبصارهم وجلودهم﴾ هەتا کاتێ دەگەنە لای ئاگرەکە، گوێ و چاوو پێستیان ,گەواهییان لەدژ ئەدەن ﴿بما كانوا يعملون﴾ لەهەر کارێ کردوویانە ﴿[21] وقالوا لجلودهم لم شهدتم علينا﴾ بە گلەییەوە بەپێستیان ئەڵێن: بۆچی بە زیانی ئێمە گەواهیتاندا؟! خۆ ئێمە لەئێوە بەرگری ئەکەین! ﴿قالوا انطقنا الله الذى أنطق كل شئ﴾ ئەڵێن: ئەوخوایەی کە هەموو شتێکی هێناوەتە قسەو گۆ، ئێمەیشی بەقسە هێنا. واتە:بە ئارەزووی خۆمان نەبوو، ئیتر بۆچی گلەییمان لێ ئەکەن؟ ﴿وهو خلقكم أول مرة﴾ هەر ئەویشە بۆ یەکەمجار لەنەبوونەوە ئێوەی بەدیهێنا ﴿وإليه ترجعون﴾ و هەر بۆلای

ئەویش دەگێڕدرێنەوە. ئیمامی (موسلیم) لە (ئەنەس)ەوە ئەڵێ: جارێك پێغەمبەر پێكەنی! فەرمووی: (هل ترون مم أضحك؟) ئایا ئەزانن لەچی پێ ئەكەنم؟! وتمان: خواو پێغەمبەرەكەی ئەزانن، فەرمووی: (من مخاطبة العبد ربه يقول: يارب! ألم تجرنی من الظلم؟ قال: يقول بلى. فيقول: فأنی لا أجيز على الأشاهدا منی. قال: يقول: كفى بنفسك اليوم عليك شهيدا، وبالكرام الكاتبين شهودا. قال: فيختم على فيه، فيقال لأركانه أنطقی، فنطق بأعماله، قال: ثم نخلی بينه وبين الكالم، قال: فيقول: بعد لكن وسحقا، فعنكن كنت أناضل)باب (٢٩٦٩/١٦). لە قسەو گفتوگۆی بەندەیەك لەگەڵ خوای خۆیدا ئەڵێ: ئەی پەروەردگارم ئایا بڕیار نەبوو لەغەدرو ستەم پەنام بدەیت. خوا ئەفەرمووێ: بەڵێ بڕیار وابوو! ئەوسا بەندەكە ئەڵێ: دە من بۆ ئەوە لە خۆم نەبێ شایەد قبوول ناكەم، خوا

الجُزْءُ الرَّابِعُ وَالعِشْرُونَ — سُورَةُ فُصِّلَتْ

وَقَالُواْ لِجُلُودِهِمْ لِمَ شَهِدتُّمْ عَلَيْنَا قَالُوٓاْ أَنطَقَنَا ٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ
أَنطَقَ كُلَّ شَىْءٍ وَهُوَ خَلَقَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢١﴾
وَمَا كُنتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَن يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَآ أَبْصَٰرُكُمْ
وَلَا جُلُودُكُمْ وَلَٰكِن ظَنَنتُمْ أَنَّ ٱللَّهَ لَا يَعْلَمُ كَثِيرًا مِّمَّا تَعْمَلُونَ
﴿٢٢﴾ وَذَٰلِكُمْ ظَنُّكُمُ ٱلَّذِى ظَنَنتُم بِرَبِّكُمْ أَرْدَىٰكُمْ فَأَصْبَحْتُم
مِّنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٢٣﴾ فَإِن يَصْبِرُواْ فَٱلنَّارُ مَثْوًى لَّهُمْ وَإِن
٤٨ يَسْتَعْتِبُواْ فَمَا هُم مِّنَ ٱلْمُعْتَبِينَ ﴿٢٤﴾ ۞ وَقَيَّضْنَا لَهُمْ
قُرَنَآءَ فَزَيَّنُواْ لَهُم مَّا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَحَقَّ عَلَيْهِمُ
ٱلْقَوْلُ فِىٓ أُمَمٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِم مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ إِنَّهُمْ
كَانُواْ خَٰسِرِينَ ﴿٢٥﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَا تَسْمَعُواْ لِهَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ
وَٱلْغَوْاْ فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ ﴿٢٦﴾ فَلَنُذِيقَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ عَذَابًا
شَدِيدًا وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَسْوَأَ ٱلَّذِى كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿٢٧﴾ ذَٰلِكَ جَزَآءُ
أَعْدَآءِ ٱللَّهِ ٱلنَّارُ لَهُمْ فِيهَا دَارُ ٱلْخُلْدِ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَجْحَدُونَ
﴿٢٨﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ رَبَّنَآ أَرِنَا ٱلَّذَيْنِ أَضَلَّانَا مِنَ ٱلْجِنِّ
وَٱلْإِنسِ نَجْعَلْهُمَا تَحْتَ أَقْدَامِنَا لِيَكُونَا مِنَ ٱلْأَسْفَلِينَ ﴿٢٩﴾

٤٧٩

ئەفەرمووێ: هەر خۆت بەشایەت بەسیت،هاوڕێ لەگەڵ دەستەی نووسەرانی بەڕێز،ئەڵێ: ئەوجا مۆر لەسەر دەمی دەدرێ، جا بەئەندامەكانی لاشەی دەوترێ: ئادەی ئێوە قسە بكەن! ئەوانیش دێنە قسەو، مۆڵەت دەدرێ، ئەوجا پێیان ئەڵێ: دەك دوور بن لەرەحمەتی خواوە دوور بن و تیا بچن، خۆ من لەئێوە دیفاع و بەرگریم ئەكرد!. ﴿[٢٢] وما كنتم تستترون ان يشهد عليكم سمعكم ولا ابصاركم ولا جلودكم﴾ وە لەدونیادا لەوە خۆتان نەئەشاردەوە كە گوێ و، چاوو پێستتان شایەدیتان لەسەر بدەن. ﴿ولكن ظننتم ان الله لا يعلم كثيرا مما تعملون﴾ بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا هێمان هەر گومانتان وابوو كە: لەزۆرێ لەو كردەوانەی ئێوە ئەنجامیان ئەدەن، بێ ئاگایە ،بۆیە بێ باكانە ئەو هەموو گوناهانەتان دەكرد ﴿[٢٣] وذلكم ظنكم الذى ظننتم بربكم أرداكم﴾، هەرئەوگومانەتان بوو، بەرامبەر بە پەروەردگارتان لەناوی بردن و تیا چوون ﴿فأصبحتم من الخاسرين﴾ وجاگەڕان لە دوڕاوو زیانمەندان و،خۆتان و دەوروبەرەكەشتان فەوتاند ﴿[٢٤] فإن يصبروا فالنار مثوى لهم﴾جا ئەگەرخۆیان رابگرن لەسەر سزاو تۆڵە، یان خۆڕانەگرن، هەر ئاگری دۆزەخە جێگایان ﴿وإن يستعتبوا فما هم من المعتبين﴾ و ئەگەر داوای لێبووردن و رەزامەندی خواش بكەن، هەرگیز بەمەرامی خۆیان ناگەن و، لێیان قبوول ناكرێ و بەر رەزامەندی خوایش ناكەون.

## مورشریكان دۆستەكانیان كاری خراپیان پێدەكەن:

﴿[٢٥] وقيضنا لهم قرناء﴾ هەر لەدنیادا چەند هاوەڵ و هاونیشینێكمان- لەشەیتان و مرۆڤە قۆڵ برەكان - بۆ پەیدا كردن و زاڵمانكردن بەسەریاندا ﴿فزينوا لهم ما بين أيديهم وما خلفهم﴾ جا بۆیان جوانكردن ئەوەی پێشیان ،لە كارو باری دنیا ،وەئەوەی پاشیان لە كارو باري ئاخیرەت ،بەناڕەواو ناهەق، ئەوانیش بە بێ باكانە رەفتاریانكردوو جولاّنەوە, وەك ئەم ئایەتەی: (وإنهم ليصدونهم عن السبيل ويحسبون أنهم مهتدون) ئەوە دووپات

دەكاتەوە. ﴿وحق علیهم القول﴾ جا بەو هۆیەوە بڕیاری سزای خواش پێویست كرایە سەریان و هاتە جێ ﴿في أمم قد خلت من قبلهم من الجن والإنس﴾ چوونە ریزی ئەو جنۆكەو ئادەمیانەوە لەپێش ئەوانەوە دووچار ببوون ﴿إنهم كانوا خاسرین﴾ بەڕاستیی ئەوانەی بەر لە وان،خەڵكێكی زیانمەند بوون،چونكە بەفەرمانی خوایان نەكرد.

**خوانەناسەكان وەصیەت بۆیەكدی دەكە گوێ بۆ قورئان نەگرن:**

﴿[٢٦] وقال الذین كفروا لا تسمعوا لهذا القرآن﴾ بێ بڕواكان بەیەكتریان گوت: گوێ بۆ ئەم قورئانە مەگرن كاتێ موحەممەد ئەیخوێنێتەوە ﴿والغوا فیه لعلكم تغلبون﴾ وە بیكەنە هەراو هۆسەو غەڵبە غەڵب تێیدا،،بەشكوم زاڵ ببن بەسەر موحەممەددا! ئینجا خوا لە جێگایەكی تردا - فەرمان بەگوێگرتن بۆقورئان دەدا- و ئەفەرمووێ: (وإذ قرئ القرآن فاستمعوا لە وانصتوا لعلكم ترحمون)٧/٢٠٤. ﴿[٢٧] فلنذیقن الذین كفروا عذابا شدیدا﴾ سوێند بە خوا ئەوانەی بێ باوەڕ بوون سزایەكی توونددیان پێ ئەچێژین ﴿ولنجزینهم أسوا الذی كانوا یعملون﴾ و بێگومان بەهۆی ئەو كارە زۆر خراپانەوە دەیانكرد سزایان دەدەین ﴿[٢٨] ذلك جزاء أعداء الله النار﴾ ئائەوەش پاداشتی دوژمنانی دینی خوایە،ئاگری دۆزەخ ﴿لهم فیها دار الخلد﴾ خانەیهەتاهەتاییان تێیدا بۆهەیە ﴿جزاء بما كانوا بآیاتنا یجحدون﴾ لەتۆڵەی ئەوەدا كە نكوڵی ئایەتەكانی ئێمەیان دەكرد ﴿[٢٩] وقال الذین كفروا ربنا أرنا الذین أضلانا من الجن والإنس﴾ بێ باوەڕو خوانەناسان دەڵێن: ئەی پەروەردگاری ئێمە! ئەودوودەستەی جنۆكە و ئادەمییەمان نیشان بدە كەرێیان لێگۆڕین ﴿نجعلهما تحت أقدامنا﴾ هەتا بیانخەینە ژێر پێمان ﴿لیكونا من الاسفلین﴾ تالە خوارترینی چینەكانی ئاگرەوەدەبن. بێگومان ئەوانەی كاری ناشەرعیی و ناهەق دەكەن وخەڵكانی تریش چاویان لێدەكەن,گوناحی ئەوانیش دەكەوێتە سەریان و, هەمووشیان لە پاشە ڕۆژدا پەشیمان دەبنەوە, بۆیە كوڕەكەی بابەگەورەشمان (ئادەم/علیە السلام) پاشكوشتنی براكەی خۆی بەناهەق, پەشیمان بوویەوە,بەڵام چ قازانجێكی بوو: (ما قتلت نفس ظلما إلا كان على إبن آدم الأول كفل من دمها لأنه أول من سن القتل)أخرجه الشیخان. ﴿[٣٠] إن الذین قالوا ربنا الله﴾ بێگومان ئەوكەسانەش گوتیان :پەروەردگارمان خوایە ﴿ثم استقاموا﴾ پاشان خۆیان راستكردبوویەوە,واتە: زۆر بەمەحكەمی لەسەر یەكناسین وەستان و, بەهیچ لایەكدا لایان نەدا ﴿تتنزل علیهم الملائكة﴾ كاتێ مردن، لە گۆڕدا، لە كاتی زیندووبوونەوەدا فریشتە دائەبەزنە لایان و, پێیان دەڵێن: ﴿الا تخافوا ولا تحزنوا﴾ لەپاشەڕۆژتان مەترسن و، بۆماڵ و منداڵیشتان-پاش خۆتان- دڵ زویرمەبن, ئێمە چاودێریان دەبین ﴿وأبشروا بالجنة التی كنتم توعدون﴾ موژدەتان لێبێت بەو بەهەشتەی بەڵێنتان پێدددرا لە دنیادا، مزگێنی بێت ئەمڕۆ ئەكەونە خۆشی و شادییەوە. ﴿[٣١] نحن أولیاؤكم فی الحیاة الدنیا وفی الآخرة﴾ ئێمە لە

الجزء الرابع والعشرون سورة فصلت

إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُواْ تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُواْ وَلَا تَحْزَنُواْ وَأَبْشِرُواْ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴿٣٠﴾ نَحْنُ أَوْلِيَآؤُكُمْ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْءَاخِرَةِ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِيٓ أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ ﴿٣١﴾ نُزُلًا مِّنْ غَفُورٍ رَّحِيمٍ ﴿٣٢﴾ وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٣٣﴾ وَلَا تَسْتَوِي ٱلْحَسَنَةُ وَلَا ٱلسَّيِّئَةُ ٱدْفَعْ بِٱلَّتِي هِيَ أَحْسَنُ فَإِذَا ٱلَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُۥ عَدَٰوَةٌ كَأَنَّهُۥ وَلِيٌّ حَمِيمٌ ﴿٣٤﴾ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴿٣٥﴾ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ نَزْغٌ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٣٦﴾ وَمِنْ ءَايَٰتِهِ ٱلَّيْلُ وَٱلنَّهَارُ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ لَا تَسْجُدُواْ لِلشَّمْسِ وَلَا لِلْقَمَرِ وَٱسْجُدُواْ لِلَّهِ ٱلَّذِي خَلَقَهُنَّ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴿٣٧﴾ فَإِنِ ٱسْتَكْبَرُواْ فَٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ يُسَبِّحُونَ لَهُۥ بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَهُمْ لَا يَسْـَٔمُونَ ۩ ﴿٣٨﴾

وَمِنْ ءَايَٰتِهِ ٤٨٠

ژیانی دونیادا دوستان بووین، وەلەپاشەڕۆژیشدا، دۆستان دەبین ﴿ولكم فيها ماتشتهي انفسكم﴾ وە لەوێ نەفستان چ بخوازێ ئامادەیە بۆتان ﴿ولكم فيها ماتدعون﴾ و هەرچیش بخوازن لەبەهەشتدا تێیدا هەیە ﴿[٣٢] نزلا من غفور رحيم﴾ ئەم مێوانداریەش، میوانداریی و پەزێزاییەکە لەلایەن پەروەردگارێکی گوناهپۆشی بەبەزەییەوە.

**فەزڵ و گەورەیی بانگەواز (دەعوە) بۆلای خوا:**

﴿[٣٣] ومن أحسن قولا ممن دعا الى الله﴾ کێ لەو کەسە قسەی جوانترە، خەڵك بە رەو یەکخواناسیی و، بۆئیسلام کردنە پەیرەوو پرۆگرام بانگ دەکات ﴿وعمل صالحا وقال انني من المسليمن﴾ و کردەوەی چاکیش دەکاو، بەشانازیشەوە ئەڵێ: من یەکێکم لەموسڵمانان؟﴿[٣٤] ولا تستوى الحسنة ولا السيئة﴾ هەرگیز چاکەو خراپە یەکسان نین، بێ شك خوا یەکەمی خۆش ئەوێ و، رقی لەدووەمە ﴿إدفع بالتى هى أحسن﴾پالنێ بە خراپەوە بە جوانترین ئاکار، واتە: بە ئاکاری جوان و جوانتر وەلأمی خراپەکار بدەرەوە ﴿فإذا الذى بينك وبينه عداوة كأنه ولى حميم﴾ ئەوسا ئەبینی ئەو کەسەی کە لەنێوان تۆو ئەودا دوژمنایەتیەك، وای لێدی دەڵێی دۆستێکی نزیك و بەسۆزە ﴿[٣٥] وما يلقاها إلا الذين صبروا﴾ خۆ ئەوئاکارچاکیەش، بەوانە نەبێ بەئارامبوون، بەکەس نادرێ، چونکە کاریمەردانە کردن لەگەڵ نامەردان و نەفاماندا، مەردانی خۆی دەوێ ﴿ومايلقاها إلا ذو حظ عظيم﴾ بەهەموو کەسێك نادرێ، مەگەر بەکەسێك کە خاوەنی بەشێکی گەورەبێ لە چاکی و صەبر ﴿[٣٦] وإما ينزغنك من الشيطان نزغ فاستعذ بالله﴾ هەرکاتێکیش لەلایەن شەیتانەوە تووشی خەتەرەو وەسوەسەیەك بوویت، ویستی تۆڵەداشتیخراپە، بەخراپە بدەیتەوە، خێرا پەنابەرە بەر خوا،چونکە پێغەمبەر ﷺ هەرکە هەڵدەسا بۆ نوێژ، ئەیفەرموو: (أعوذ بالله السميع العليم من الشيطان الرجيم من همزه ونفخه ونفثه). پێشەوا ئەحمەد , تەبەری ﴿إنه هو السميع العليم﴾ چونکە تەنها ئەوە بیسەری زانا.

**نیشانەکانی دەسەلأتی خوا:**

﴿[٣٧] ومن آياته الليل والنهار والشمس والقمر﴾ لە نیشانەکانی تاك وتەنیایی خوایە: شەوو رۆژو خۆرو مانگ،چونکە هەر یەکەیان بە چەند بەرنامەیەکی قەشەنگ و رێك و پێك دامەزراون و کاری خۆیان دەکەن ﴿لا تسجدوا للشمس ولا للقمر﴾دەسا ئێوەش نە بۆ خۆر سوژدە بەرن،وەنە بۆ مانگ، چونکە ئەوانە هەردوو دروستکراوی خودان و، ئەوانیش سوژدە هەر بۆ ئەو دەبەن ﴿واسجدوا لله الذى خلقهن﴾ ئێوە سوژدە هەربۆ ئەو خودایە بەرن ئەوانی دروستکردووە ﴿إن كنتم إياه تعبدون﴾ ئەگەر دەتانەوێ بەهەقیانەت خودا بپەرستن.﴿[٣٨] فإن استكبروا﴾ ئینجا ئەگەر ئەوان لەخۆبایی بوون , کڕنووش بەرن بۆ خوا ﴿فالذين عند ربك يسبحون له بالليل والنهار﴾ جا ئەو (فریشتانە) کە لەنزیکی پەروەردگارتەوەن , شەوو رۆژ هەر تەسبیحاتی ئەو ئەکەن ﴿وهم لا يسأمون﴾ هیچ کات لەکاری خۆیان ماندوو و وەڕەز نابن. (جابر) –خوا لێی رازی بێ– دەڵێ: هەرگیز نەبەشەوگارجێنوبدەن،وە نە بەرۆژگار، وەنە بەخۆرو مانگ و با، چونکە ئەوانە بۆ هەندێ خەڵك هۆی میهرەبانی و رەحمەتن، بۆ دەستەیەکی تریش،سزاو نیقمەتن)الحافظ أبو يعلي. ﴿[٣٩] ومن آياته انك ترى الأرض خاشعة﴾ لەنیشانەکانی دەسەلأتداریی ئەوە کەتۆ زەویی وادەبینی مات و وشك و بێ گیاو بێ خێرە و هەستی لەبەرنەماوە ﴿فإذا انزلنا عليها الماء اهتزت وربت﴾ئینجا هەر کاتێ بارانمان لێ باراند، بەئاسایی دەبزوێ و گەشە ئەکات و هەڵئەداو دەبووژێتەوەو هەموو جۆرە گیایەکی لێ دەردێت ﴿إن الذى احياها لمحيى الموتى﴾ بەراستیی هەرئەو

زاتەی کە ئەو زەوییە مردووەی،بەو شێوە زیندوو کردەوە، هەرئەوەش زیندووکەرەوەی مردووەکانە ﴿إنه على كل شئ قدير﴾، چونکە بەراستیی ئەو خوایە تواناى بەسەر هەموو شتێکا هەیە.

**کلا بوون لە نیشانەکانی خوا:**

﴿[٤٠] إن الذين يلحدون في آياتنا لا يخفون علينا﴾ بێگومان ئەوکەسانەلە ئاستی ئایەتەکانی ئێمە کلا دەبن و هەق ئەگۆڕن. واتە: لادەدەن و،تانەو توانج و پلاریان تیّ ئەگرن, لە ئێمە ناشارڕێنەوە ﴿افمن يلقى فى النار خير أم من يأتى آمنا يوم القيامة﴾ ئایا ئەو کەسە فڕیّ دە درێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە باشترە،؟ یان ئەوکەسە ڕۆژی قیامەت بە ئەمن و ئاسایش دێت؟ ﴿اعملوا ما شئتم﴾ دەساحەزلەچی دەکەن ,بیکەن ئەوجا خۆتان ئەبیننەوە ﴿إنه بما تعملون بصير﴾ چـونکە هەرچـی بکـەن, ئەوخوایـە دەیبینـیّ و بینایەپییّ ﴿[٤١] إن الذين كفروا بالذكر لما جاءهم﴾ بەڕاستیی ئەوانە کاتیّ قورئانیان بۆ هات, باوەڕیان پـیّ نەهێنا,ئەوە تۆڵەیـەکی گـەورەیان لیّ ئەسـەنریّ ﴿وإنه لكتاب عزيز﴾، و بەراستی ئەو قورئانە، کتێبێکە هەرگیز ناشکێت و نابەزیّ و زۆر بەرێزە ,ئـەتوانیّ ڕەدی هـەموو نکوولی,نکوولی کارێـک بداتـەوە ﴿[٤٢] لا يأتيه الباطل من بين يديه ولا من خلفه﴾ هـەرگیز ڕەفتـارو گوفتـاری هـیچ وپووچـی تـیّ نایـەت , نەلـەپێش خـۆی و, نەلـە پـاش خـۆی ﴿تنزيل من حكيم حميد﴾ چـوون لەلایـەن خوایـەکی قسـە لـەجیّ وهەمیشـە سوپاسکراوەوە نێرراوە ﴿[٤٣] ما يقال لك إلا ما قد قيل للرسل من قبلك﴾هەرئـەوەش بـە تـۆ دەگـوترێ:کـە بـە پەیامبـەرانی پێشـی تـۆ وتـراوە ,جا کـەواتـە ئارامـت بیێوخۆڕاگربـە ﴿إن ربك لذو مغفرة وذو عقاب اليم﴾ بەراستیی پـەروەردگارت خـاوەن بەخششـێکی گـەورە, خـاوەن سـزایەکی بـە ئێشـە، دەتـوانیّ گونـاهی موسـڵمان عافووبکـا، بۆشـی هەیـە سزای بەئێشـیان بـدات، کەواتـە هـەمووکاروبارێکی خـوّت هەربەخوابسپێرە ,پێغەمبەرﷺ لە بارەی فەزڵ و بەخششی خواوە دەفەرمویّ: (ئەگەر بەخشش و لێبوردنی خوا نەبووبا، ژیان و زیندەگی لەزەتی نەدەبوو، ئەگەر هەڕەشەو تۆڵەشی نەبووبا، هەمووکەسیّ پاڵیّ لیّدەدایەوەو(کاری چاکی نەدەکرد). ئیبن ئەبیحاتم.

**قورئان بە عەجەمیش بووایە، هەر ڕەخنەیان دەگرت:**

﴿[٤٤] ولو جعلناه قرآنا اعجميا﴾ ئەگەر ئێمە قورئانمان گێڕابا بەزمانێك غەیرە عەرەبیی,وەك کافرەکان داوا دەکەن ﴿لقالوا لولا فصلت آياته﴾ ئەو وەختە ئەیانوت: بۆچی ئایەتەکانی ڕوون نەکراوەتەوەبەزمانێك تێبگەین؟، ئەم ئایـەتی: (ولو نزلناه على بعض الأعجمين فقرأه عليهم ماكانوا به مؤمنين)١٩٨/٢٦. هەرجەخت لە سەرئەو درۆو عینادەیانە, لەبارەی ئیمان وبڕوا هێنانەوە. ﴿أعجمي وعربي﴾ ئایا دەگونجیّ قورئان بە زمانی غەیرە عەرەبی بیّ

الجزء الرابع والعشرون — سورة فصلت

وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنَّكَ تَرَى ٱلْأَرْضَ خَـٰشِعَةً فَإِذَآ أَنزَلْنَا عَلَيْهَا ٱلْمَآءَ
ٱهْتَزَّتْ وَرَبَتْ ۚ إِنَّ ٱلَّذِىٓ أَحْيَاهَا لَمُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰٓ ۚ إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ
قَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِىٓ ءَايَـٰتِنَا لَا يَخْفَوْنَ عَلَيْنَآ ۗ أَفَمَن
يُلْقَىٰ فِى ٱلنَّارِ خَيْرٌ أَم مَّن يَأْتِىٓ ءَامِنًا يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۚ ٱعْمَلُوا۟ مَا شِئْتُمْ ۖ
إِنَّهُۥ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٤٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِٱلذِّكْرِ لَمَّا جَآءَهُمْ ۖ
وَإِنَّهُۥ لَكِتَـٰبٌ عَزِيزٌ ﴿٤١﴾ لَّا يَأْتِيهِ ٱلْبَـٰطِلُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ
خَلْفِهِۦ ۖ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ ﴿٤٢﴾ مَّا يُقَالُ لَكَ إِلَّا مَا قَدْ قِيلَ
لِلرُّسُلِ مِن قَبْلِكَ ۚ إِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ وَذُو عِقَابٍ أَلِيمٍ ﴿٤٣﴾
وَلَوْ جَعَلْنَـٰهُ قُرْءَانًا أَعْجَمِيًّا لَّقَالُوا۟ لَوْلَا فُصِّلَتْ ءَايَـٰتُهُۥٓ ۖ ءَا۬عْجَمِىٌّ
وَعَرَبِىٌّ ۗ قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ هُدًى وَشِفَآءٌ ۖ وَٱلَّذِينَ
لَا يُؤْمِنُونَ فِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرٌ وَهُوَ عَلَيْهِمْ عَمًى ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ
يُنَادَوْنَ مِن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ ﴿٤٤﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَـٰبَ
فَٱخْتُلِفَ فِيهِ ۗ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَقُضِىَ
بَيْنَهُمْ ۚ وَإِنَّهُمْ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ ﴿٤٥﴾ مَّنْ عَمِلَ صَـٰلِحًا
فَلِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا ۗ وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّـٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿٤٦﴾

٤٨١

و، پەیامبەریش عەرەب بێ؟! (والعجمی: الذي ليس من العرب كان فصيحا أوغير فصيح. والأعجمی: الذي لا يفصح كان من العرب أو من العجم, فالأعجم ضد الفصيح وهو الذي لا يبين كلامه). ﴿قل هو للذين آمنوا هدى وشفاء﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ: ئەو قورئانە ڕێنمایی و شفایە بۆ ئەوکەسانەی باوەڕیان هێناوە, دەرمان و چارەی دەردانە بۆ نەخۆشی دوودڵی و شك و گومان و، لە پاڵ ئەوەشدا بۆ ئێش و ئازار. ﴿والذين لا يؤمنون في آذانهم وقر﴾ ئەوانەش باوەڕ ناکەن، لەگوێیەکایاندا گرانی وهەیە نابیسن. واتە:سەبارەت بە قورئان، خۆیان کەڕو کوێر کردووەو، لێی تێناگەن ﴿وهو عليهم عمى﴾ وئەو بۆ کافران نابینایی، ڕێی ڕاستی پێدەرناکەن ونابینن و هەتا بێ ستەمکارتردەبن , وەك لە جێگایەکی تردا – لە بارەی شفابوونیەوە بۆ باوەڕداران و,بۆ بێباوەڕانیش نابیناو دڵ تەنگییە– ئەفەرمووێ: (وننزل من القرآن ما هو شفاء ورحمة للمؤمنين ولا يزيد الظالمين إلا خسارا)٨٢/١٧. ﴿أولئك ينادون من مكان بعيد﴾ ئائەوانە(بێ‌باوەڕەکان) دەڵێت لەجێگایەکی دوورەوە بانگ دەکرێن واتە: چۆن کەسێك لە دوورەوە بانگ دەکرێت، نابیسێ و تێناگات، ئەمانیش وەکو ئەوان نابیسن و، هیچ تێناگەن، هەر بۆجەخت لە سەر ئەم مانایە ,خوا لە جێگایەکی تردا ئەفەرموێ: (ومثل الذين كفروا كمثل الذي ينعق بما لا يسمع الا دعاء ونداء صم بكم عمى فهم لا يعقلون)١٧١/٢. ﴿[45] ولقد آتينا موسى الكتاب فاختلف فيه﴾ سوێند بەخوا, بێگومان(تەورات)مان دابە (مووسا)ش کەچی هۆزەکەی جیاوازی و کێشەیان تێیدا دروست بوو,واتە: بوونە دوو تاقم: هەندێکیان بڕوایان پێکردو, هەندێکیشیان بەدرۆیان دانا! ﴿ولو لا كلمة سبقت من ربك لقضى بينهم﴾ خۆئەگەرلە بەرگوفتێك نەبا لە خواوەندیپەروەردگارتەوە درابوو ئەی پێغەمبەر! کە سزایان دوا بخات بۆ ڕۆژی قیامەت , ئەوا بەزوویی بڕیاری تیاچوونیان دەردەچووو سزا دەدران ﴿وانهم لفي شك منه مريب﴾وە بەراستیی هۆزەکەت لە دوودڵیەکی گومانهێنەردان.

### هەموو کەسێك کار بۆ خۆی دەکا:

﴿[46] من عمل صالحا فلنفسه ومن أساء فعليها﴾ ئەوەی کارێکی چاکی کردبێ، هەربۆ خۆیەتی و، هەرخۆی کەڵکی لێدەست دەکەوێ، ئەوەش کارێکی خراپی کردبێ، ئەویش هەر بە زیانی خۆیەتی,واتە: زیانەکەی هەربۆ خۆی دەگەڕێتەوە ﴿وما ربك بظلام للعبيد﴾ وپەروەردگاریشت هەرگیز غەدربازو ستەمکار نیە لەبەندەکانی, وە بێ کەم و کورت پاداشتیان ئەداتەوە.

(لە ١٤١٧/٤/٢٩ك بەرامبەر ١٩٩٦/٩/١٢ لەجزمی (٢٤) بوومەوە، لەهەڵەبجە، لە(ڕاگەیاندن) زۆرزۆر منەت وسوپاس بۆخوا.

کۆتایی جزمی بیست و چواردم

ولله الحمد و المنة.

*** *** ***

### هەر خوا دەزانێ قیامەت کەی دێ:

﴿[47] إليه يرد علم الساعة﴾ زانیاریی بەرپابوونی ڕۆژی دوایی و، زانینی کاتی هاتنەکەی تەنها بۆلای خوا ئەگێڕدرێتەوە، جا کەواتە هەمووکات وشیاربن وئاگاتان لەخۆتان بێت، نەوەك کتووپڕ دەرگاتان پێ بگرێت، بۆیە پێغەمبەریش ﷺ لەوەڵامی (جوبریل) دا فەرمووی: ((ماالمسؤولُ عنها بأعلمَ مِنَ السائلِ)) متفق/عليه (فتح الباری: ١٤٠/١). وەقورئانیش ئەفەرمووێ: (الى ربك منتهاها، ٤٤/٧٩، یان دەفەرمووێ: (لايجليها لوقتها إلاهو)١٨٧/٧.

﴿وما تخرج من ثمرات من أكمامها﴾ هەرچی بەرووبووم و میوەیەك چەكەرە دەكاو لە چرۆ وبەرگەكەی دەردەچێت ﴿وما تحمل من انثی﴾ وەهیچ مێینەیەك ئاوس وباردار نابێ ﴿ولا تضع﴾ وئەوەی ناو زكیدانانیێ و نازێ ﴿إلا بعلمه﴾ مەگەر خواپێی زانا وئاگایە، واتە: هیچ شتێك نەلەئاسمان، نەلەزەوی لە ئاگاداریی خوا دەرناچێت ﴿ویوم ینادیهم این شركائی﴾ وە لەرۆژی قیامەتدا (هاوبەش دانەرەكان) كاتێ لەلایەن خواوە بانگ ئەكرێن و پێیان ئەوترێ: ئادەی كوان هاوبەشانێ كە بۆمنتان دادەنا، ئێستا لە كوێن و بۆیارمەتیان نادەن؟ ﴿قالوا ءآذناك مامنا من شهید﴾ لەوەلامدا ئەلێن: خوایە! هەرئێستا بە ئاشكرا ڕادەگەیەنین و ئاگادارت ئەكەین كە لەراستیدا هیچ شایەدێكمان نیە شایەدی بدات: تۆشەریكت هەبێ ﴿[٤٨] وضل عنهم ما كانوا یدعون من قبل﴾ ئیتر ئەوبتانەی كە لەپێشەوە بەناوی خواوە ئەیانپەرستن و هاواریان بۆدەبردن لێیان گووم دەبن و بەناهەق دەرئەچن و هیچ كە لكێكیان پێناگەیەنن ﴿وظنوا ما لهم من محیص﴾ ودڵنیاش دەبن ئیتر هیچ پەناگاو چارەسەرێكیان نیە بۆ خۆرزگاركردن لە سزای خوا ﴿[٤٩] لایسئم الانسان من دعاء الخیر﴾ مرۆی كافرهەرگیز لەداخوازیی خێروچاكە وخۆشییو ئاسوودە بۆخۆی؛ بێزارومانـدوو نـابێ، هـەردەم داوای دارایـی، تەندروسـتیی، دەسـەلات دەكـات و بەهەڵەداوان بەدوایـدا دەگەڕێ ﴿وإن مسه الشر فیئوس قنوط﴾ وە ئەگەر بەلاو نەخۆشیی وهەژاریی تووش بوو،ئەوە نائومێدێكی تەمابڕە لە مەرحەمەتی خوا.

﴿إِلَيۡهِ يُرَدُّ عِلۡمُ ٱلسَّاعَةِۚ وَمَا تَخۡرُجُ مِن ثَمَرَٰتٍ مِّنۡ أَكۡمَامِهَا
وَمَا تَحۡمِلُ مِنۡ أُنثَىٰ وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلۡمِهِۦۚ وَيَوۡمَ يُنَادِيهِمۡ أَيۡنَ
شُرَكَآءِي قَالُوٓاْ ءَاذَنَّٰكَ مَا مِنَّا مِن شَهِيدٖ ﴿٤٧﴾ وَضَلَّ
عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَدۡعُونَ مِن قَبۡلُۖ وَظَنُّواْ مَا لَهُم مِّن مَّحِيصٖ ﴿٤٨﴾
لَّا يَسۡـَٔمُ ٱلۡإِنسَٰنُ مِن دُعَآءِ ٱلۡخَيۡرِ وَإِن مَّسَّهُ ٱلشَّرُّ فَيَـُٔوسٞ
قَنُوطٞ ﴿٤٩﴾ وَلَئِنۡ أَذَقۡنَٰهُ رَحۡمَةٗ مِّنَّا مِنۢ بَعۡدِ ضَرَّآءَ مَسَّتۡهُ
لَيَقُولَنَّ هَٰذَا لِي وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةٗ وَلَئِن رُّجِعۡتُ إِلَىٰ
رَبِّيٓ إِنَّ لِي عِندَهُۥ لَلۡحُسۡنَىٰۚ فَلَنُنَبِّئَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِمَا عَمِلُواْ
وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنۡ عَذَابٍ غَلِيظٖ ﴿٥٠﴾ وَإِذَآ أَنۡعَمۡنَا عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ
أَعۡرَضَ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ فَذُو دُعَآءٍ عَرِيضٖ
﴿٥١﴾ قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ إِن كَانَ مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ ثُمَّ كَفَرۡتُم
بِهِۦ مَنۡ أَضَلُّ مِمَّنۡ هُوَ فِي شِقَاقِۭ بَعِيدٖ ﴿٥٢﴾ سَنُرِيهِمۡ
ءَايَٰتِنَا فِي ٱلۡأٓفَاقِ وَفِيٓ أَنفُسِهِمۡ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمۡ أَنَّهُ ٱلۡحَقُّۗ
أَوَلَمۡ يَكۡفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ ﴿٥٣﴾ أَلَآ إِنَّهُمۡ
فِي مِرۡيَةٖ مِّن لِّقَآءِ رَبِّهِمۡۗ أَلَآ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَيۡءٖ مُّحِيطُۢ ﴿٥٤﴾




### ناڵەباری مرۆڤ:

﴿[٥٠] ولئن اذقناه رحمة منا من بعد ضراء مسته﴾ وە ئەگەر لە داوای ئەوزیانەی پێی گەیشتبوو، هەرخۆشییەكی پێ بچێژین: دارایی و، تەندروستیی بدەینێ ﴿لیقولن هذا لی﴾ زۆر بەمتمانەوە دەڵێ: ئەمە هیخۆمە، لەبەرشیاوی خۆم دەستم كەوتووە، واتە: لەخوای ناناسێ! ﴿وما اظن الساعة قائمة﴾ وپێشم وایە قیامەت بەرپا نەبێت، وەك ئەفەرموێ: (كلا إن الانسان لیطغی، ان رآه استغنی)٩٦/٦-٧. ﴿ولئن رجعت إلی ربی﴾ و گریمان ئەگەر گێردرامەوە بۆ لای پەروەردگارم، واتە: "وەك ئێوە ئەڵێن قیامەت هات و بەرپابوو! ﴿إن لی عنده للحسنی﴾ ئەوە بێگومان پاشەرۆژی باشترم بۆ هەیە لە لای خوا ﴿فلننبئن الذین كفروا بماعملوا﴾ جا خوا هۆشیاریان دەكاتەوەو ئەفەرموێ: جابێگومان ئەوانەی وا بێ بڕوان و ئەوجۆرە قسانەش ئەكەن , ئێمە كردارو ڕەفتارە ناشیرینەكانیان لێئاگادار دەكەین ﴿ولنذیقنهم من عذاب غلیظ﴾ وبێگومان سزایەك, لە جۆری سزایەكی دژواریان پێ دەچێژین ﴿[٥١] وإذا انعمنا علی الإنسان اعرض ونئآبجانبه﴾ وكاتێ چاكە لەگەڵ مرۆ بكەین، لەباتی ئەوە كەسوپاسی خوای لەسەر بكات ,ڕوو وەرئەگێڕێ و دوورئەكەوێتەوە لەجێبەجێكردنی فەرمانەكانی خوا! ﴿وإذا

مسه الشر فذو دعاء عريض﴾ وكاتیٚ تووشی نەهامەتیی وناخۆشی دەبیٚ، ئەبینی بەردەوام دۆعاو نزاو پاڕانەوەو ناڵە ناڵی زۆرگەرم وپان وپۆڕ دەست پیٚ دەكا بۆ ڕزگار بوونی لەوبەڵایە!.

**بەڵگەكانی ڕاستیی قورئان:**

﴿٥٢ قل ارايتم ان كان من عند الله﴾ پێیان بڵیٚ: چی ئەڵێن ئەگەر ئەم قورئانە لەلایەن خواوە بێت ﴿ثم كفرتم به﴾ پاشان ئێوەش ، بڕواتان پێی نەبێت، دەزانن حاڵتان چۆن دەبیٚ! ﴿من اضل ممن هو فی شقاق بعيد﴾ چ كەسێك گومڕاتره لەوەی كە لە خیلاف ودووبەرەكییەكی دوور لە هەق و ڕێنماییدابێت؟ واتە: ئێوە لەهەموو كەسێك سەرلێشێواوتر و گومڕا ترن ﴿٥٣ سنريهم آياتنا فی الآفاق وفی انفسهم﴾ بەڵیٚ خوای گەورە بەتایبەت لەسەدەی بیستەمدا گەڵیٚ شتی سەرسوڕهێنەری نیشانی ئادەمیزاد دا، لەئاسمان و زەوی ودەریاو، هەر لەخودی ئادەمیی خۆیشیدا كەهەر هەموویان بەڕاشكاوی داوا لەمرۆڤ دەكەن بڕوا بێنیٚ بەخوای گەورە و بەقورئانەكەی، وەك ئەفەرمووێ: ئێمە لەئایندەدا بەڵگەو نیشانەكانی خۆمانیان نیشان دەدەین لەسەر ڕاستیی ئەم قورئانەو، دەسەڵاتی خۆمان لەئاسۆكانی بوونەوەرداو، وە لەخودی خۆشیاندا ﴿حتی يتبين لهم انه الحق﴾ ئەمەش بۆ ئەوەیە تاچاك بۆیان دەركەوێ كە بەڕاستیی ئەوقورئانە ڕاستە ﴿اولم يكف بربك انه علی كل شئ شهيد﴾ و ئایا شایەدی پەروەردگارت بەس نیە كەبەسەر هەموو شتێكدا ئاگاو زانایە و، هیچ شتێكی لا ون نابێت؟! ﴿٥٤ الا إنهم فی مرية من لقاء ربهم﴾ هۆشیار بن خەڵكینە! كە بەڕاستیی ئەوانە لەگەڵ ئەوهەموو بەڵگانەدا لە دیداری پەروەردگاریان لەدوو دڵیی و گوماندان ، بۆیە بڕوایان بەزیندوو بوونەوە هەرنیە ﴿الا إنه بكل شئ محيط﴾ ئاگادار بە! كەبەڕاستیی ئەوخوایەش ئاگای لەهەموو شتێك هەیە لەم بوونەوەرەدا، هەر لەئادەمزادەوە – بەچاك و، خراپەوە– تا تەواوی گەردیلەكان و، وردتر لەوانیش لای ئەویەكسانە، وە هیچ كەس ناتوانێت لە دەستی دەرچێت.

كۆتایی تەفسیری سوورەتی (فوصصیلەت)

*** *** ***

## ٤٢- سوورەتی ( شوورا )یە

## مەككەییەو ( ٥٣ ) ئایەتە

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

ئەم سوورەتە وەك سوورەتە مەككەییەكانی تر باسی بیروباوەڕو عەقیدەو ئایدۆلۆژیی موسڵمانان دەكات، باسی پەیام و بەرنامەكەی پێغەمبەر ﷺ دەكات، هاوكات لەگەڵ باسێكی زیندووبوونەوەو تۆڵەو پاداشتدا، ئەوسا بنەمایەكی گشتیی سەرەكیی لە ژیانی كۆمەڵدا كە: بریتیە لە بنەمای ڕاوێژو مشوٚرەت لەهەڵسەنگاندنی كارە سەرەكیی و گرنگەكاندا ﴿بسم الله الرحمن الرحيم * ١ حم * ٢ عسق﴾ ئەم پیتانە وەك لەپێشەوە چەند جار باسكرا هێماو ئاماژەن بۆ پەككستنی موشریك و هاوبەشدانەرەكان، وەك پێیان بڵێت: كە ئەگەر نكووڵی قورئان دەكەن، دەسا ئێوەش فەرموون هەر لەم پیتانە سورەتێك وەك سورەتەكانی ئەو بێنن.دیارە كەهیچ كات نەیاتوانیوە شتیوا بكەن، بۆیە دەبیٚ تەسلیم بن و ددان بەوەدا بنێن كەهەر خوایە ئەو قورئانەی ناردووە.

**هەر خوا یە وەحی دەنێریٚ:**

﴿٣ كذلك يوحی إليك وإلی الذين من قبلك اللهُ العزيزُ الحكيمُ﴾ وەك ئەو وەحیە خوای باڵادەستی كارجوان، وەحیی بۆ تۆو بۆ پەیامبەرانی پێش تۆش دەنێریٚ. (خاتوو عائیشە (خوا لێی ڕازی بیٚ) دەڵیٚ: (حاریسی كوڕی

هیشام) له پێغەمبەری پرسی ﷺ: وەحییت چۆن بۆدێ..؟ فەرمووی: هەندێ جار دەنگێك دێ وەك دەنگی جەرەس، ئەم شێوەیە لە هەموو شێوەکانی تری وەحیی, قورستر و سەخت ترە بۆ من، جاکە کۆتاییشی دێ،دەبینم هەموویم وەرگرتووە و لەبەرمە! هەندێ جاریش فریشتەی وەحیەکە لە شکڵ و سیمای پیاوێکدا دێ و قسەم لەگەڵ دەکاو منیش لێی وەر ئەگرم. خاتوو (عائیشە) دەڵێ: بەراستی هەندێ کات لەرۆژی زۆر سەرمادا نێو چاوانی پێغەمبەرم دەدیت ﷺ عەرەقی لێدەهاتە خوارێ. (فتح الباری: ٢٥/١. موسلیم: ١٨١٦/٤). ﴿[٤] لە مافی السموات وما فی الأرض﴾ هەرچی لەئاسمانەکان ولە زەوییدایە، هەر هەموو موڵکی خوایەو ئەو خاوەنیەتی ﴿وهو العلی العظیم﴾ هەرئەویشە بڵندی مەزن ﴿[٥] تکاد السموات یتفطرن من فوقهن﴾ ئاسمانەکان -کە چەندە بەهێزن- خەریکە لەبەرامبەر گەورەیی ومەزنیی خوا, لەت لەت و پارچە پارچە بېن و، بەسەر یەکتردا بکەون! ﴿والملائکة یسبحون بحمد ربهم﴾ و فریشتەکانیش هەمیشە سەرگەرمی تەسبیحات و ستایشی پەروەردگاری خۆیانن، لەسوورەتێکی تردا هەر لە بارە ی تەسبیحاتی فریشتەوە ئەفەرموێ: (الذین یحملون العرش ومن حوله یسبحون بحمد ربهم ویؤمنون بە، ویستغفرون للذین آمنوا..)٧/٤٠. لێرەشدا ئەفەرموێ: ﴿و یستغفرون لمن فی الأرض﴾ داوای لێبوردنیش دەکەن بۆئەوانەی لەزەویدان، واتە: لەوانەی باوەڕیان هێناوە, وەکو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: (ویستغفرون للذین آمنوا..) ﴿الا إن الله هو الغفور الرحیم﴾ هۆشیاربە! کە بەراستیی ئەو پەرستراوە هەقە (اللە), هەر خۆی گوناهپۆشی میهرەبانە ﴿والذین اتخذوا من دونه أولیاء﴾ و ئەوانەش کەلەباتی خوا، دۆست و یار بۆ خۆ دەگرن ﴿الله حفیظ علیهم﴾ خوا بۆخۆی چاودێرە بەسەریانەوە، هیچ شتێکی لە دەس دەرناچێ ودەزانێ خەریکی چین ﴿وما انت علیهم بوکیل﴾ وتۆیش بریکاریان نیت، تا بەزۆر باوەڕیان پێ بێنیت، کاریشت هەر راگەیاندنە.

الجزء الخامس والعشرون | سورة الشورى

سورة الشورى (٤٢) آياتها ٥٣

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

حمٓ ۝١ عٓسٓقٓ ۝٢ كَذَٰلِكَ يُوحِيٓ إِلَيۡكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكَ
ٱللَّهُ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ۝٣ لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ
ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡعَظِيمُ ۝٤ تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرۡنَ مِن فَوۡقِهِنَّۚ
وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يُسَبِّحُونَ بِحَمۡدِ رَبِّهِمۡ وَيَسۡتَغۡفِرُونَ لِمَن فِي
ٱلۡأَرۡضِۗ أَلَآ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ۝٥ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ
مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَ ٱللَّهُ حَفِيظٌ عَلَيۡهِمۡ وَمَآ أَنتَ عَلَيۡهِم بِوَكِيلٖ
۝٦ وَكَذَٰلِكَ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ قُرۡءَانًا عَرَبِيّٗا لِّتُنذِرَ أُمَّ ٱلۡقُرَىٰ وَمَنۡ
حَوۡلَهَا وَتُنذِرَ يَوۡمَ ٱلۡجَمۡعِ لَا رَيۡبَ فِيهِۚ فَرِيقٞ فِي ٱلۡجَنَّةِ وَفَرِيقٞ فِي
ٱلسَّعِيرِ ۝٧ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَهُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَلَٰكِن يُدۡخِلُ
مَن يَشَآءُ فِي رَحۡمَتِهِۦۚ وَٱلظَّٰلِمُونَ مَا لَهُم مِّن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٍ ۝٨
أَمِ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَۖ فَٱللَّهُ هُوَ ٱلۡوَلِيُّ وَهُوَ يُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰ وَهُوَ
عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ۝٩ وَمَا ٱخۡتَلَفۡتُمۡ فِيهِ مِن شَيۡءٖ فَحُكۡمُهُۥٓ
إِلَى ٱللَّهِۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبِّي عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ وَإِلَيۡهِ أُنِيبُ ۝١٠

٤٨٣

**قورئان بۆ ترساندنی مەککەو دەڤەری مەککەیە:**

﴿[٧] وکذلك أوحینا إلیك قرآنا عربیا﴾ وەك ئەو وەحیکردنە ئاشکرایە, قورئانێکی عەرەبیی رەوان و پاراویشمان بۆ تۆ وەحیکرد ﴿لتنذر ام القری ومن حولها﴾ هەتا مەککە (ئوممولقورا) و خەڵکی دەوروبەری (واتە: هەموو خەڵکی گۆی زەوی) بترسێنی و، ئاگاداریان بکەیت لە سزاو جەزرەبەی خوا. بۆیە بە (مەککە)ش ئەڵێن (ام القری)، چونکە بناغەو دایکی هەموو گوندەکانی ئەو دەڤەرەیە.. وە لەبەر شەرەف و گەورەییەك کە بەهۆی کەعبەی پیرۆزەوە پێیبڕاوە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((واللە إنكِ لخیرُ أرضِ الله واحبُّ أرض اللة إلیّ،ولولا انی اُخرجْتُ منكِ ماخَرَجْتُ)).پێشەوا ئەحمەد. ﴿وتنذر یوم الجمع لا ریب فیه﴾ بەتایبەتی ئەوانە لەرۆژێ بترسێنیت کە تەواوی

دروستکراوەکان تێیدا خڕ دەکرێنەوەو، هیچ دوو دڵی و گومانێکیش لە هاتنیدا نیەو هەردێ ﴿فریق فی الجنة وفریق فی السعیر﴾ و خەڵکەکەش دەبنە دوو دەستە، دەستەیەکیان لە بەهەشتدان و، دەستەیەکیشیان لە دۆزەخدان، واتە: بڕواداران لە بە هەشتتان و، بێ بڕوایانیش لە دۆزەخدا، خوا لەجێگایەکی تردا - لە بارەی سەختی ئەو رۆژەو , زیانمەندی دەستەیەك لە مەردم تێیدا دەفەرموێ: (یوم یجمعکم لیوم الجمع ذلك یوم التغابن). کەوابوو خوای میهرەبان ئەو مەسەلەیە (خەڵکەکە دەبیچتە دوو دەستە) بڕیوەتەوە، بۆیەپێغەمبەرجارێ تەشریفیهات ودوونامە بەدەستیەوەبوون و، فەرمووی: ئەمەی دەستی راستم لەلایەن ربیولعالەمینەوە دەرچووەوناوی گشت خەڵکانی بەهەشتیی، باب و باپیریان و، ناوی هۆزو خێڵیانی تێدایە و، ئیتر کەم و زیاد ناکات،



فَاطِرُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا
وَمِنَ الْأَنْعَامِ أَزْوَاجًا يَذْرَؤُكُمْ فِيهِ لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ
وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ ﴿١١﴾ لَهُ مَقَالِيدُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ
يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَن يَشَاءُ وَيَقْدِرُ إِنَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴿١٢﴾
۞ شَرَعَ لَكُم مِّنَ الدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِ نُوحًا وَالَّذِي أَوْحَيْنَا ٤٩
إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰ أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ
وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ كَبُرَ عَلَى الْمُشْرِكِينَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَيْهِ اللَّهُ
يَجْتَبِي إِلَيْهِ مَن يَشَاءُ وَيَهْدِي إِلَيْهِ مَن يُنِيبُ ﴿١٣﴾ وَمَا
تَفَرَّقُوا إِلَّا مِن بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ الْعِلْمُ بَغْيًا بَيْنَهُمْ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ
سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ إِلَىٰ أَجَلٍ مُّسَمًّى لَّقُضِيَ بَيْنَهُمْ وَإِنَّ الَّذِينَ
أُورِثُوا الْكِتَابَ مِن بَعْدِهِمْ لَفِي شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ ﴿١٤﴾
فَلِذَٰلِكَ فَادْعُ وَاسْتَقِمْ كَمَا أُمِرْتَ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ
وَقُلْ آمَنتُ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ مِن كِتَابٍ وَأُمِرْتُ لِأَعْدِلَ
بَيْنَكُمُ اللَّهُ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ لَنَا أَعْمَالُنَا وَلَكُمْ أَعْمَالُكُمْ
لَا حُجَّةَ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ اللَّهُ يَجْمَعُ بَيْنَنَا وَإِلَيْهِ الْمَصِيرُ ﴿١٥﴾



ئەمەی دەستی چەپیشم ناوو نیشانی تەواوی گشت جەحەندەمییەکانی تێدایەو, هیچ زیادو کەم ناکات. پێشەوا ئەحمەد ﴿[8] ولوشاء لجعلهم أمة واحدة﴾ خۆ ئەگەر خوا ویستبای هەموویانی ئەکردە یەك گەل و یەك ئوممەت،واتە:کۆی دەکردنەوە لەسەر ئایینی پیرۆزی ئیسلام, وەکو لە جێگایەکی تردا دەفەرموێ: (ولوشاء الله لجمعهم علی الهدی). ﴿ولکن یدخل من یشاء فی رحمته﴾ بەڵام ویستی خوای گەورە وایە، دەیەوێ هەرکەسێك خۆی بیەوێت - شیاویش بێت - بیباتە ناو میهرەبانی وبەزەیی خۆیەوە ﴿والظالمون ما لهم من ولی ولا نصیر﴾ ستەمکاران و بێ باوەڕانیش, هیچ دۆست و یارمەتیدەرێکیان بۆ نیە , لەسزای پاشە رۆژ رزگاریان بکات.

**هەر خوایە مەولاو دۆستی راستتان:**

﴿[9] أم اتخذوا من دونه أولیاء﴾ یاخۆ جگە لە خوا دۆستیان بۆ خۆیان گرتووە! ﴿فالله هو الولی﴾ جاخۆ هەر(اللە)یە دۆستی راستەقینە وپشتیوان ﴿وهو یحیی الموتی﴾ وهەر ئەویشە مردووان زیندوو دەکاتەوە ﴿وهو علی کل شئ قدیر﴾ و هەرئەویشە توانا و دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە ﴿[10] وما اختلفتم فیه من شئ فحکمه إلی الله﴾ ئەوی کێشەو جیاوازیتان تێیدا بوو، لەبارەی باوەڕو بێباوەڕیەوە، دەبێ حوکمەکەی بگێڕدرێتەوە بۆلای خوا، چونکە ئەوخۆی دەیبڕێتەوەو دەزانێت کێ لەسەر هەقەو، کێش لەسەر ناهەقە، خوای گەورە قورئانی ناردووەوگێڕاویەتی بە مەنهەج، پێغەمبەریش ﷺ بەیانی دەکاو کێشەکان یەکلا دەکاتەوە. ﴿ذلکم الله ربی﴾ ئا ئەو حوکم وبڕیار دەرەیە خوای پەروەردگارم ﴿علیه توکلت﴾ هەر بەو پشت دەبەستم ﴿وإلیه أنیب﴾ و هەر بۆ لای ئەویش ئەگەڕێمەوە بۆ چارەسەری گشت گیروفتێکم ﴿[11] فاطر السموات والأرض﴾ بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوییە ﴿جعل لکم من انفسکم ازواجا﴾ هەر لەخۆشتان هاوسەرو ژنانی بۆ داناون ﴿ومن الأنعام ازواجا﴾ وەلە وشترو گاو مەڕو بزن،جووتێ نێرو مێی بۆ دروستکردوون ﴿یذرؤکم فیه﴾ زۆرتان دەکا بە زاو زێ ﴿لیس کمثله

شئ﴾ هیچ شتێك نیه لەوێنەی ئەو (خوا)یە،نە لە زاتیا، نە لە سیفاتیا، نەلەکرداریا، بۆ خۆی تەنیایەو، لەهەموو شتێك، بێ نیازەو، هەمو شتێکیش نیازمەندە بەو ﴿وهو السمیع البصیر﴾ ئەویشە بیسەری بینا, بەئاگایە بە وتەی بەندەکانی، بینایە بۆ کاروکرداریان ﴿[١٢] له مقالید السموات والأرض﴾ کلیلی هەموو خەزێنەکانی ئاسمانەکان و زەوی تەنها بەدەستی ئەوە، کەوابوو هەمووشتێکیش هەر هی ئەوە ﴿یبسط الرزق لمن یشاء ویقدر﴾ بۆ هەر کەسێك خۆی بیەوێت رزق و رۆزی بۆ زیاد دەکات، بۆ هەر کەسێکیش کە بیەوێ، کەم و کورتی دەکاو سنوورێکی بۆ دادەنێت ﴿إنه بکل شئ علیم﴾ چونکە ئەو خوایە بە هەموو شتێك ئاگاو زانایە، ئەو خۆی چاك دەزانێ سەروەت و ماڵ و سامان بۆ مرۆ چاکە، یان خراپ.

**گشت پێغەمبەران یەك ینداریان بووە:**

﴿[١٣] شرع لکم من الدین ما وصی به نوحا والذی أوحینا إلیك وما وصینا به إبراهیم وموسی وعیسی﴾ هەر ئەو دین و ئایینەی بە(نووح و ئیبراهیم و مووساو عیسا)ی (ئولولعەزم) و لێبڕاوو نەبەزاومان سپارد، کردمانە دین وئایین بۆ ئێوەش(ئەی ئوممەتی ئیسلام!) واتە: پێغەمبەران هەموو یەك ئامانج و یەك مەبەستیان بووە، یەك دین ویەك بیروباوەڕیان بووە،ئەگەرچیهێندێ جیاوازییان هەبووبێ لەشەریعەت و بەرنامەیاندا، وەکو دەفەرموێ: (وما أرسلنا من قبلك من رسول إلا نوحی إلیه أنه لاإله إلا أنا فاعبدون)، پێغەمبەریش ﷺ هەرلەو بارەوە دەفەرموێ: ((نحنُ مَعْشَر الأنبیاء أولاد عَلاَّتٍ، دیننا واحد)) فتح الباری:٦/٥٥٠. پێمان گوتن: ﴿أن أقیموا الدین ولا تتفرقوا فیه﴾ کە پەرتەوازەو کۆمەڵ کۆمەڵ مەبن تێیدا ,واتە:دەبێهەموو بەرێك و پێکی رێبازی ئەو ئایینە راگرن و دەست لە یەکتاپەرستیی قایەمکەن و دەستی لێبەر نەدەن، و کێشەو ناکۆکیی و جیاوازیتان تێیدانەبێ،بەڵێ یەکناسین و نوێژو کڕنووش بردن و، زەکات و رۆژوو،گشت ئەمانە لە هەموو ئایینە ئاسمانییەکاندا شتێکی سەرەکین و پێچویستەئەبێ بپارێزرێن و گۆڕانکارییان تێدا نەکرێت.وە بۆ دووپاتی ئەمە لە سووروتی(ئەحزاب)یشدا هاتووەودەفەرموێ: (وإذ أخذنا من النبیین میثاقهم ومنك ومن نوح وإبراهیم وموسی وعیسیابن مریم..) ئیبن کەسیر لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا دەڵێ: (وصی الله جمیع الأنبیاء بالإئتلاف والجماعة، ونهاهم عن الإفتراق والإختلاف) واتە: خواوەصیەتی بە هەموو پێغەمبەران کردووە: کە یەکگرتووو کۆمەڵ بن, وەلەپەرتەوازەو ئیختیلاف, رێی لێگرتن ﴿کبر علی المشرکین ما تدعوهم إلیه﴾ ئەوشتە تۆ هاوبەشدانەرانی بۆ بانگ دەکەیت، وەك یەکتاپەرستیی و، خوا بەیەکناسین لەسەر دڵ و دەروونی بتپەرستان و موشریکان زۆر گرانە ﴿الله یجتبی إلیه من یشاء﴾ بەڵام خۆ خوای گەورە خۆی کەسانی شیاوو شایستە هەڵ ئەبژێرێ بۆ گەیاندنی بەرنامەکەی خۆی ﴿ویهدی إلیه من ینیب﴾ و هیدایەت و رێنموونی خەڵکێکی بۆ دەکات کە دەگەڕێنەوە بۆلای خۆی, ئیتر هیدایەت و رێنوێنی بەدەست ئەوان نییە ﴿[١٤] وما تفرقوا إلا من بعد ما جاءهم العلم﴾ وئەو جوولەکەو گاورانەش, لە ئایینی یەکخواپەرستیی نەبوونە دەستە دەستە، مەگەر دوای ئەوەی کە بەڵگەو زانیاریی تەواویان بۆ هات لەسەر راستیی ئیسلام! ﴿بغیا بینهم﴾ ئەویش هەر لەبەر ئێرەیی و حەسادەت و ستەم و سەرکێشیخۆیان ﴿ولولا کلمة سبقت من ربك إلی أجل مسمی﴾ ئەگەر پەروەردگاری تۆ لە ئەزەلدابڕیاری نەدابا, کە سزای تاوانباران دوابخرێ, تاکاتێکی دیارییکراو ,بۆ هاتنی کاتی قیامەت ﴿لقضی بینهم﴾ دەمێك بوو بڕیاری سزا لە نێوانیاندا درا بوو ﴿وإن الذین أورثوا الکتاب من بعدهم لفی شك منه مریب﴾ وئەوانەش کە پاش ئەوان بوونە خاوەنی تەورات و ئنجیل و, لەسەردەمی پەیامبەردا دەژیان ,ئەوانیش لەگومانێکی گومانهێنران لەکتێبەکەیان , بۆیە بێ باوەڕ بوون!

﴿[١٥] فلذلك فادع واستقم كما امرت﴾ جا لەبەر كێشەو پەڕاگەندەییی خاوەن نامەكان، تۆش بۆ ئایینی یكخواپەرستیی گشت مەردم بانگی بكە، وە هەر بەو شێوەیە لەلایەن پەروەردگارتەوەفەرمانت پێدراوە، سووربە لەسەر ئەمكارە، وە لەسەر ئەو ئایینە راوەستاو بە ﴿ولا تتبع اهواءهم﴾ و لەهەواو ئارەزوویان پەیڕەوی مەكە، چونكە هەر دەستەو گرووپەی هەوڵدەدا بەلای خۆیدا بتبات ﴿وقل آمنت بما انزل الله من كتاب﴾ وبڵێ: من باوەڕم هەیە بە هەر پەیام و نامەیەك خوا دای بەزاندۆتە خوارەوە بڕوام هەیە، ئەگەرچی جوولەكەو گاورەكان بڕوایان بەهەندێكی نییە ﴿وامرت لأعدل بينكم﴾ وە لەلایەن خواوە فەرمانیشم پێدراوە كە لەنێوانتاندا هەردەم بە دادگەرانە بڕیار بدەم ﴿الله ربنا وربكم﴾ (اللە) پەروەردگاری ئێمەو ئێوەشە،بۆیە پێویستە هەموومان بەتاك وتەنیا بیناسین ﴿لنا اعمالنا ولكم اعمالكم﴾ كارو كردارمان بۆ خۆمان، و كاروكردارتان بۆ خۆتان، هەركەسە پاداشتی ئەو كارە وەر ئەگرێتەوە كردوویەتی.، وەك لە جێگایەكی تردا خوا ئەفەرموێ: (وإن كذبوك فقل لى عملى ولكم عملكم انتم بريئون مما أعمل وأنا برئ مما تعملون). ﴿لا حجة بيننا وبينكم﴾ لە نێوانی ئێمەو ئێوەدا هیچ بەڵگەو بەهانەیەك نەماوە باس نەكرابێ ﴿الله يجمع بيننا وإليه المصير﴾ جا لە رۆژی قیامەتدا پەرستراوی هەق (اللە) ئێمەو ئێوە كۆ ئەكاتەوە, خۆ گەڕانەوەو چارەنووسیش هەر بۆلای ئەوە، ئەم ئایەتەش هەر دووپاتی ئەو راستییە دەكاتەوە كە دەفەرمووێ: (قل يجمع بيننا ربنا ثم يفتح بيننا بالحق وهو الفتاح العليم)٢٦/٣٤.

**حاشاكەرانی دینی خوا بەر غەزەب دەكەون:**

﴿[١٦] والذين يحاجون فى الله﴾ ئەوانەی لەمەڕ ئایینی خواوە كێشمەكێشم ئەكەن و ئەیانەوێ خەڵك لە رێگەو رێبازی خوا دوور بخەنەوە ﴿من بعد ما استجيب له﴾ پاش ئەوەی كە بەدەنگییەوە هاتن و وەڵامیان دایەوە ﴿حجتهم داحضة عند ربهم﴾ بەڵگەكەیان لای پەروەردگاریان ,پووچەڵ و باتڵە ﴿وعليهم غضب﴾ و بەر رق و خەشمێكی زۆر گەورە كەوتوون "لەدونیادا" ﴿ولهم عذاب شديد﴾ وە لەپاشە رۆژیشدا سزایەكی سەختیان بۆ هەیە ﴿[١٧] الله الذى انزل الكتاب بالحق والميزان﴾ خوای هەق ئەو زاتەیە كە نامە ئاسمانیەكانی بە هەق ورەوا بۆ سەرپەیامبەران دابەزاندووە, لەگەڵ تەرازووی دادگەرییدا, بۆ حوكم و بڕیار لەنێوان خەڵكدا بەدادپەروەرانە ﴿وما يدريك لعل الساعة قريب﴾ تۆ چی ئەزانی؟ لەوانەیە هاتنی قیامەت نزیك بێت, جاكەواتە هەمیشە كارو كرداری چاك ئەنجام بدە ﴿[١٨] يستعجل بها الذين لا يؤمنون بها﴾ ئەوانەی بە قیامەت بڕوایان نیە بەگاڵتەوە پەلە لەهاتنی ئەكەن! ﴿والذين آمنوا مشفقون منها﴾ ئەوانەی بڕوایان هێناوە بەردەوام لەهاتنی قیامەت ئەترسن ﴿ويعلمون انها الحق﴾ دەشزانن كە بێگومان ئەو سات و رۆژە راست و هەقەو هەر پێش دێت، پیاوێ بەدەنگێكی زۆر بەرزو وتی: ئەی موحەممەد!



وَالَّذِينَ يُحَاجُّونَ فِي اللَّهِ مِن بَعْدِ مَا اسْتُجِيبَ لَهُ حُجَّتُهُمْ دَاحِضَةٌ عِندَ رَبِّهِمْ وَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ وَلَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ (١٦) اللَّهُ الَّذِي أَنزَلَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ وَالْمِيزَانَ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ السَّاعَةَ قَرِيبٌ (١٧) يَسْتَعْجِلُ بِهَا الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِهَا وَالَّذِينَ آمَنُوا مُشْفِقُونَ مِنْهَا وَيَعْلَمُونَ أَنَّهَا الْحَقُّ أَلَا إِنَّ الَّذِينَ يُمَارُونَ فِي السَّاعَةِ لَفِي ضَلَالٍ بَعِيدٍ (١٨) اللَّهُ لَطِيفٌ بِعِبَادِهِ يَرْزُقُ مَن يَشَاءُ وَهُوَ الْقَوِيُّ الْعَزِيزُ (١٩) مَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ الْآخِرَةِ نَزِدْ لَهُ فِي حَرْثِهِ وَمَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ الدُّنْيَا نُؤْتِهِ مِنْهَا وَمَا لَهُ فِي الْآخِرَةِ مِن نَّصِيبٍ (٢٠) أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعُوا لَهُم مِّنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَن بِهِ اللَّهُ وَلَوْلَا كَلِمَةُ الْفَصْلِ لَقُضِيَ بَيْنَهُمْ وَإِنَّ الظَّالِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ (٢١) تَرَى الظَّالِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا كَسَبُوا وَهُوَ وَاقِعٌ بِهِمْ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فِي رَوْضَاتِ الْجَنَّاتِ لَهُم مَّا يَشَاءُونَ عِندَ رَبِّهِمْ ذَلِكَ هُوَ الْفَضْلُ الْكَبِيرُ (٢٢)

پێغەمبەریش ﷺ هەر وەك ئەو وەڵامی دایەوە فەرمووی: (هاووۆم) بڵێ چی ئەڵێیت؟ وتی: قیامەت کەی دێت؟ ئەویش فەرمووی: ((ویحك إنها كائنة، فما أعددت لها؟)). هاوار بۆ تۆ، دڵنیابە کە ئەو ڕۆژە هەر پێش دێت، بەڵام ئەتۆ چیت بۆ ئامادە کردووە..؟ وتی: تەنها خۆشەویستی خواو پێغەمبەر، فەرمووی: ((انت مع من أحببت))، دەتۆ لەگەڵ ئەو کەسە دەبیت کە لەدونیادا خۆشت ویستووە. فتح الباری: ٥٧٣/١. ﴿الا إن الذين يمارون فى الساعة لفى ضلال بعيد﴾ هۆشیار بن! بەڕاستیی ئەوانەی وا لە بارەی ڕۆژی دوایی شەڕە قسەو دەمە دەمێ ئەکەن، لەبزر بوون و گومڕاییەکی زۆر سەخت و دوور لەهەقدان، واتە: زۆر سەرلێشێواو سەرگەردانن ﴿[١٩] الله لطيف بعباده﴾ پەرستراوی هەق(الله))خوایەکی بەلوتف و بەمیهرەبانە بە بەندەکانی ﴿يرزق من يشاء﴾ بەهەر کەسێك خۆی بیەوێ ڕزق و ڕۆز زۆر زۆر ئەدات ، ئەگەرچی زۆریش سەرکێش بێت ﴿وهو القوى العزيز﴾ هەر ئەویشە بە هێزی دەسەڵاتدار ﴿من كان يريد حرث الآخرة نزد له فى حرثه﴾ هەرکەسێك داهات و کشتی دوا ڕۆژی لا مەبەست بێت، ئەوە ئێمە بەزیادەوە بەرەکەتی بۆ تێ ئەخەین و لەبەرووبوومی کشتەکەی زیاد ئەکەین، واتە: ئەگەر بەکردەوەکانی مەبەستی پاداشتی پاشە ڕۆژ بێت، ئەوە ئێمەش پاداشتی بۆ زیاد ئەکەین بە چەند قات ﴿[٢٠] ومن كان يريد حرث الدنيا نؤته منها﴾ وە ئەو کەسەیش کە تەنها بەروبووم و داهات وکشتی دونیای دەوێ، ئەوە لەم دونیا بەشی دەدەین ﴿وماله فى الآخرة من نصيب﴾ ئیتر لەپاشە ڕۆژدا هیچ بەش و بەهرەیەکی بۆ نیە, بێ شك خواش مەیلی لەهەرچەندە ببێ، هەر ئەوەندە ئەدا، ئەم فەرموودەیەش هەر پشتگیری ئەم ڕاستییە ئەکا: ((بشر هذه الأمة بالسناء والرفعة والنصر والتمكين في الأرض، فمن عَمَلَ منهم عمل الآخرة للدنيا لم يكن له فى الآخرة من نصيب)) مسند الإمام أحمد. ١٣٤/٥. ﴿[٢١] أم لهم شركاء﴾ ئاخۆ ئەوانە ڕێگەی خواناسین دەگرن، یا خۆ چەند هاوبەشێك بۆ خوا دادەنێن ﴿شرعوا لهم من الدين ما لم يأذن به الله﴾ چەند یاساو بەرنامەیەکیان بۆ داهێنابن لە ئایین کە بەهیچ شێوەیە خوا مۆڵەتی نەدابن, خۆ شتی وا نەبووە؟! ﴿ولولا كلمةالفصل لقضى بينهم﴾ ئەگەر بەڵێنی خوا نەبا بە دوا خستنی سزا بۆ ڕۆژی قیامەت هەر زوو لەدونیادا بڕیار درابوو لە نێوان ئەوان و ئیماندارەکاندا ﴿وإن الظالمين لهم عذاب أليم﴾ و بێگومان بۆ ستەمکاران بە شیرك جەزرەبەو سزایەکی بە ئێش هەیە.

**لە قیامەتدا موشریکان دادەچڵەکێن:**

﴿[٢٢] ترى الظالمين مشفقين مما كسبوا﴾ وە لەو ڕۆژەدا ئەو ستەمکارانە ئەبینی چۆن لەئەنجامی ئەو تاوانانەی کردوویانە دەترسن "بێتەوە ڕێیان" ﴿وهو واقع بهم﴾ بەڵام چ کەڵکێکی هەیە، وە تووشیشیان ئەبێ ,بترسن یان نەترسن ﴿والذين آمنوا وعملوا الصالحات فى روضات الجنات﴾ بەڵام ئەوانەی کە بڕوایان هێناوەو کارە چاکەکانیان ئەنجامداوە, لە گوڵزار گەلی بەهەشتەکاندان ﴿لهم ما يشاؤن عند ربهم﴾ هەر شتێکیان بوێ، لە لایەن پەروەردگاریانەوە پێیان دەگات ﴿ذلك هو الفضل الكبير﴾ ئا ئەوە, ئەو فەزڵ و خەڵات و بەهرەی گەورە و بێ وێنەیە, هیواو ئاواتەکان پێوەی بەستراون.

**ڕزق و ڕۆزیی بۆ بەهەشتییان ئامادەیە:**

﴿[٢٣] ذلك الذى يبشر الله عباده الذين آمنوا وعملوا الصالحات﴾ ئەو فەزڵە گەورەیەیە خوا موژدەیئەو بەندانەی خۆی پێدەدا بڕوایان هێناوەو کارە چاکەکانیان ئەنجام داوە ,بۆ ئەوەی هەر لەئێستاوە بە زەوق و شەوق بن تا ئەگەنە ئەو جێگایە ﴿قل لا أسألكم عليه أجرا إلا المودة فى القربى﴾ بەوانە بڵێ- کەوەڵامت نادەنەوە- من لە سەرگەیاندنی پەیامەکەی خوا, هیچ کرێ و مزەیەکم لە ئێوە ناوێت، ئەوە نەبێت کە ئێوە لەبەر خوا مافی خزمایەتی

بپارێزن و وازم لێ بێنن , باپەیامەکەم بگەیەنم، بەڵێ لەم جێگایەدا گەلێ ریوایەت هەیە دەربارەی دیاریی کردنی مەبەست، و مانای ﴿إلا المودة في القربى﴾ (سەید قوتب) خوا لێی خۆش بێت ئەڵێت: پەیامبەر ﷺ فەرمانی پێکرا کە بەقورەیش بڵێ: من لەبەرامبەر نزیك خستنەوەتان بە (روضات الجنات)ەوەو، دوور خستنەوەتان لەو سزای دۆزەخە هیچ پاداش و کرێیەکم ناوێ، مەگەر تەنها ئەوە کەخزمایەتی بپارێزن، واتە: پەیامبەر ﷺ لەگەڵ هەموو تیرەکانی قورەیشدا، خزمایەتی هەبوو، ئەو هەوڵەیشی تەنها لەو رووەوەیە کە مافی خزمایەتی بەسەرەوە هەیە، بۆیە ئاوا هەوڵی دوور خستەوەیان لەدۆزەخ دەدات و بەبەهەشت نزیکیان دەکاتەوە. چونکە ریوایەتێك لە (ئیبن عەبباس)ـەوە هاتووە کە: پێشەوا (بوخاریی) (فتح الباری: ٤٢٦/٨). هێناویەتی: (انه سأل عن قوله تعالى: ﴿إلا المودة في القربى﴾ فقال سعيد بن جبير: (قربى آل محمد، فقال ابن عباس: عجلت إن النبي ﷺ لم يكن بطن من بطون قريش إلا كان له فيهم قرابة، فقال: إلا أن تصلوا ما بيني وبينكم من القرابة). بۆیە (تەبەری)ش -خوا پلەی بەرز بکاتەوە- ئەڵێت: (إلا أن تودوني قرابتي منكم، وتصلوا الرحم التي بيني وبينكم). (بەندە)ش بە بۆچوونی خۆم رێز لێنان لەخانەوادەو بنەماڵەو خزمانی پەیامبەر ﷺ ئیتر هەرکەسێك بگرێتەوە -الأقرب فالأقرب- وەك سەعیدی کوڕی جوبەیر ئەڵێت: (قربى: آل محمد) پێویستییەکی سەرشانی موسڵمانانە، بەڵام بەئەندازەیە کە زیادەڕەوی تیا نەکرێ و، ئەوانیش -خزم و کەسەکانی ئەو- تەنها بەرێی ئەودا بچن، ئەگینا وەك زانایان ئەڵێن: مافیان ئەڕواو دەسووتێ، بەڵکو ئەبێ هەوڵی راستکردنەوەیان بدرێ، وە ئەو ریوایەتەیش کە سەعید ئەیهێنێ: (..قالوا يا رسول الله! من هم هؤلا الذين نودهم؟ قال: على وفاطمة وأبناؤهما)، بۆ ئەوە (شێخی ئیبنی حەجەر) لەفتح الباری بەرگی (٦٤/٨)دا. ئەڵێت: (وإسناده ضعيف لمخالفته هذا الحديث الصحيح الذى رواه البخارى عن إبن عباس. وە ئیمامی (ئیبن کەسیر)یش ئەڵێت: (وهذا إسناد ضعيف). وە زاناکانی تر ئەڵێن: (وذكر نزول الآية في المدينة بعيد فإنها مكية، ولم يكن إذ ذلك لفاطمة -رضى الله عنها- أولاد بالكلية، فإنها لم تتزوج بعلى رضي الله عنه إلا بعد بدر من السنة الثانية من الهجرة. والحق تفسير هذه الآية بما فسرها حبر الأمة وترجمان القرآن عبد الله بن عباس رضي الله عنهما كما روى عنه البخارى - يشير إلى الحديث المتقدم- ولا ننكر الوصاة بأهل البيت والامر بالإحسان إليهم واحترامهم وإكرامهم فإنهم من ذرية طاهرة من أشرف بيت وجد على وجه الأرض فخرا ونسبا ولا سيما إذا كانوا متبعين للسنة النبوية الصحيحة والواضحة الجليلة كما كان عليه سلفهم كالعباس وبنيه وعلى وأهل بيته وذريته رضي الله عنهم). وە بۆ زیادە ئاگاداری تەماشای ئەم سەرچاوانە بکرێ: البخاري٧٧/٧، صحيح مسلم/ باب فضائل أهل بيت رسول الله ﷺ، كتاب مناقب للترمذي، منهاج السنة/ ابن تيمية/١٠٢/٧. روح المعاني/ الآلوسى. ﴿ومن

الجزء الخامس والعشرون — سُورَةُ الشُّورَىٰ

ذَٰلِكَ ٱلَّذِي يُبَشِّرُ ٱللَّهُ عِبَادَهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِۗ قُل لَّآ
أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ أَجۡرًا إِلَّا ٱلۡمَوَدَّةَ فِي ٱلۡقُرۡبَىٰۗ وَمَن يَقۡتَرِفۡ حَسَنَةً نَّزِدۡ
لَهُۥ فِيهَا حُسۡنًاۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ شَكُورٌ ٢٣ أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ
كَذِبًاۖ فَإِن يَشَإِ ٱللَّهُ يَخۡتِمۡ عَلَىٰ قَلۡبِكَۗ وَيَمۡحُ ٱللَّهُ ٱلۡبَٰطِلَ وَيُحِقُّ ٱلۡحَقَّ
بِكَلِمَٰتِهِۦٓۚ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ٢٤ وَهُوَ ٱلَّذِي يَقۡبَلُ ٱلتَّوۡبَةَ
عَنۡ عِبَادِهِۦ وَيَعۡفُواْ عَنِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ وَيَعۡلَمُ مَا تَفۡعَلُونَ ٢٥
وَيَسۡتَجِيبُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَيَزِيدُهُم مِّن فَضۡلِهِۦۚ
وَٱلۡكَٰفِرُونَ لَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدٞ ٢٦ ۞ وَلَوۡ بَسَطَ ٱللَّهُ ٱلرِّزۡقَ
لِعِبَادِهِۦ لَبَغَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَٰكِن يُنَزِّلُ بِقَدَرٖ مَّا يَشَآءُۚ إِنَّهُۥ بِعِبَادِهِۦ
خَبِيرُۢ بَصِيرٞ ٢٧ وَهُوَ ٱلَّذِي يُنَزِّلُ ٱلۡغَيۡثَ مِنۢ بَعۡدِ مَا قَنَطُواْ
وَيَنشُرُ رَحۡمَتَهُۥۚ وَهُوَ ٱلۡوَلِيُّ ٱلۡحَمِيدُ ٢٨ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦ خَلۡقُ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَثَّ فِيهِمَا مِن دَآبَّةٖۚ وَهُوَ عَلَىٰ جَمۡعِهِمۡ
إِذَا يَشَآءُ قَدِيرٞ ٢٩ وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٖ فَبِمَا
كَسَبَتۡ أَيۡدِيكُمۡ وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٖ ٣٠ وَمَآ أَنتُم بِمُعۡجِزِينَ
فِي ٱلۡأَرۡضِۖ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٖ ٣١

٤٨٦ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِ

يقترف حسنة نزد له فيها حسنا﴾ و هەركەسێك كارێكی چاك ئەنجام بدات، ئێمەش زیاتر چاكەی لەگەڵ ئەكەین ,یەك بەدە تا حەوت سەد، تا زیاتریش، وەك خوا خۆی ئەفەرمووێ: (إن الله لا يظلم مثقال ذرة وإن تك حسنة يضاعفها ويؤت من لدنه أجرا عظيما)٤٠/٤. ﴿إن الله غفور شكور﴾ بێگومان پەرستراوی هەق ,خوا یەكی گوناهپۆشی پێزان و بەوەفایە ﴿[٢٤] ام يقولون افترى على الله كذبا﴾ یا خود ئەوانە ئەڵێن: موحەممەد ﷺ لەسەر خوا درۆیەكی هەڵبەستووە؟! ﴿فإن يشإ الله يختم على قلبك﴾ خۆئەگەر وابێ‌موشریكان ئەیڵێن: واتە: تۆ لە سەر خوا هەڵدەبەسیت، ئەوەئەگەر خوا بیەوێ مۆر دەنێت بەسەردڵتدا,بۆ ئەوە هیچ تێنەگەیت، ئایەتی: (ولو تقول علينا بعض الأقاويل لأخذنا منه باليمين ثم لقطعنا منه الوتين فما منكم من أحد عنه حاجزين)٦٩/٤٤-٤٧. جەخت لە سەر ئەو مەبەستە دەكاتەوە. ﴿ويمح الله الباطل﴾ وەخوا ئاسەواری نارەواو باگلٚ ئەسڕێتەوە ﴿ويحق الحق بكلماته﴾ وە هەق ورەواش بەفەرمانی خۆی دەچەسپێنێ ﴿إنه عليم بذات الصدور﴾ چونكە ئەوزانایە بە هەرچی لە دڵە كاندایە. ﴿[٢٥] وهو الذي يقبل التوبة عن عباده﴾ هەر ئەویشە كە پەشیمانی لە بەندەكانی خۆی وەرئەگرێ ﴿ويعفو عن السيئات﴾ ولە تاوان وگوناحانیان- بچوك و گەورە- بۆهەر كەسێك خۆی بیەوێ دەبووری. ئایەتی: (ومن يعمل سوءا أو يظلم نفسه ثم يستغفر الله يجدالله غفورا رحيما) ٤/١١٠ دەر بارەی وەر گرتنی تەوبەی عەبدانە ﴿ويعلم ما تفعلون﴾ وە دەشزانێ چی دەكەن ﴿[٢٦] ويستجيب الذين آمنوا وعملوا الصالحات﴾ وە داواو پاڕانەوەی - ئەوانەی بڕوایان هێناوەو كارە چاكەكانیان ئەنجامداوە- وەڵام ئەداتەوە ﴿ويزيدهم من فضله﴾ وە بۆیان زیاد ئەكا لە بەخششی خۆی. تەفسیری (تەبەریی) ئەڵێ: (يشفعون في إخوان إخوانهم)، شەفاعەت بۆ دۆستی دۆستیان دەكەن ﴿والكافرون لهم عذاب شديد﴾ وەبۆ بێبڕواكانیش جەزرەبەو سزایەكی سەخت هەیەو، وەڵامیشیان ناداتەوە. ﴿[٢٧] ولو بسط الله الرزق لعباده لبغوافي الأرض﴾ وەئەگەر خوا بە لێشاو رۆزیی بۆ بەندەكانی خۆی فرە كردبا،ئەوا یاخیی دەبوون لە زەویدا ﴿ولكن ينزل بقدر مايشاء﴾ واناكات، بەڵكو ئەندازەیەك ئەدات كەخۆی بیە وێ، چونكە ئەو خۆی چاك دەزانێ چۆن رۆزی دابەش بكاو, هەركەسەش چەندەی بداتێ ﴿إنه بعباده خبير بصير﴾ وەبەڕاستی ئەو بەبەندەكانی خۆی ئاگادارو بینایە ﴿[٢٨] وهو الذي ينزل الغيث من بعد ماقنطوا﴾ وەهەرئەو خوایەشە دوای نائومێدی بوونی مەردوم لە باران , كاتی گرانی وقات وقڕی باران دەنێرێ ﴿وينشر رحمته﴾ و بەهرەو میهرەبانی خۆی بەسەر بەندەكانیدا بڵاو ئەكاتەوە ﴿وهو الولي الحميد﴾ هەرئەویشە وسەرپەرشت كاری بەندەكا نیەتی، هەرئەویشە سوپاسكراو.

## هێندێ لەنیشانەكانی خوا:

﴿[٢٩] ومن آياته خلق السموات والأرض﴾ وە لە بەڵگەو نیشانەكانی دەسەڵاتی خوایە, بەدی هێنانی ئاسمانەكان وزەویی ﴿وما بث فيهما من دابة﴾ وئەو زیندەوەرو جم وجوولەكرانە تییایاندا بڵاو بوونەتەوە ﴿وهوعلى جمعهم إذا يشاء قدير﴾ هەركاتیش بۆخۆی مەیلی ببێ توانای هەیە هەموویان كۆبكاتەوە بۆ حیساب و لێكۆڵینەوەو پاداش ﴿[٣٠] وما اصابكم من مصيبة فبما كسبت ايدكم﴾ وەهەر بەڵایەكتان تووش بوو, ئەوە بەهۆی كردەوەی خۆتانەوەیە ﴿ويعفو عن كثير﴾ لەزۆرێك لەگوناهەكانیشتان ئەبوورێ ولە سەری سزاتان نادا، ئەگەرچی شایستەی سزایش بن ﴿[٣١] وماانتم بمعجزين في الأرض﴾ وەئێوە خوا دەسەوسان ناكەن بە هەڵهاتنتان لە دەستیی لەزەویدا ﴿وما لكم من دون الله من ولي ولا نصير﴾ وجگە لەخواش هیچ دۆست و یارمەتیدەرێكتان نییە. ﴿[٣٢] ومن آياته الجوار في البحر كالأعلام﴾ لەنیشانە كانی دەسەڵاتی ئەوە: ئەو كەشتییانەی كە هەروەك كێو لەناو دەریادا دێن و دەچن ﴿[٣٣] إن يشأ

يسكن الريح فيظللن رواكد على ظهره﴾ خۆئەگەر خوا بیەوێ (با) کەهۆیە بۆ ڕۆیشتنی کەشتییەکان ڕادەگرێ، ئەوجا کەشتییەکان لەسەرپشتی دەریاوە قەتیس دەمێننەوە و ناتوانن جووڵە بکەن ﴿إن فی ذلك لآیات لكل صبار شكور﴾ بێگومان لەوەدا بەڵگەو نیشانەی زۆر هەن بۆ هەر خۆراگرێکی سوپاسگوزار , لەحاڵەتی خۆشیی و، ناخۆشییدا ﴿[٣٤] أو یوبقهن بما کسبوا﴾ یان بەهۆی تاوانی سەرنشینەکانیانەوە نقوم دەکاو لەناویان ئەبات ﴿ویعفوا عن كثیر﴾ لەگەڵ ئەوەیشدا لەزۆرێکی گوناهەکانیان چاوپۆشی دەکا, نقومیان ناکا ﴿[٣٥] ویعلم الذین یجادلون فی آیاتنا ما لهم من محیص﴾ و با ئەو کەسانەش دەربارەی ئایەتەکانمان دەمبازیی و کێشمەکێشمان ئەکەن، بزانن کە هیچ خۆلادان و دەرەتانێکیان نیە، لە سزای ڕۆژی قیامەت ﴿[٣٦] فما اوتیتم من شئ فمتاع الحیاة الدنیا﴾ ئینجا هەر شتێك بەئێوە بەخشراوە, لەزەت و بەهرەی ژیانی ئەم دونیایەو، زۆر بەزوویی ئەڕوات و نامێنێتەوە ﴿وما عند الله خیر وابقی للذین آمنوا وعلی ربهم یتوكلون﴾ ئەو پاداشت و بەخششەش لای خوایە بۆ ئەوانەی باوەڕیان هێناوە، وە بە پەروەردگاریان پشت ئەستوورن , باشتروو پایەدار ترە ﴿[٣٧] الذین یجتنبون كبائر الإثم والفواحش﴾ ئەوانەش لەگوناهی گەورە (وەك شیرك و پیاو کوشتن و..)دووردەگرن، وە لەکاری ناپەسەندو دزێویش هەروا ﴿وإذا ما غضبوا هم یغفرون﴾ وەکاتێکیش تووڕەو قەڵس بوون چاوپۆشی ئەکەن. ئیمامی (بوخاریی) ئەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ((ما انتقم لنفسه قط، إلا أن تنتهك حرمات الله)) قەت لەبەر نەفسی خۆی , تۆڵەی لەکەس نەسەندووە، مەگەر بڕیارو فەرمانەکانی خوا بێ ڕێز کرابان!

**ڕاوێژ لە ئیسلامدا:**

﴿[٣٨] والذین استجابوا لربهم﴾ ئەوکەسانەش کە بەدەنگی بانگی پەروەردگاری خۆیانەوە چوون ﴿وأقاموا الصلاة﴾ و بەتێرو تەسەل نوێژ یانکرد ﴿وأمرهم شوری بینهم﴾ وکاروباریان ولەنێو خۆیاندا بە مەشوەرەت و پرس و ڕاوێژ بوو،واتە:هەر شتێ بێتە پێشێ، ئەوان بەخێرایی مەشوەرەتی بۆ دەکەن و لێیدەکۆڵنەوە، ئەوسا بڕیاری کۆتایی لەسەر دەدەن. لەسوورەتی (ئال عیمران)، ئایەتی (١٥٩)یشدا- دەربارەی شووراو ڕاوێژ- دەفەرموێ:(وشاورهم فی الأمر..).لەوێ زیاتر باسمان لەبارەی شووراوە کردووە. بەڵێ چ پێغەمبەرو ﷺ چ هاوەڵانیی، هەرگیز بێ تەگبیرو ڕاوێژو لێکۆڵینەوە کارو ڕووداوە گرنگەکانیان ڕا نەدەپەڕان، پێویستە ئەوەش بڵێین کە ڕاوێژ لەو شتانەدا دەکرێت کە: دەقێکی شەرعیی بۆ نەهاتبێ، وەك لێکۆڵینەوە بۆ جەنگ لەگەڵ هەڵگەڕاوەکاندا لەسەر دەمی پێشەوا (ئەبووبەکر)داو، میراتی (فەدەك) و، تۆڵەی شەرابخۆرو ژمارەی شەلاقەکان و، بەرانبەر ڕووداوەکان، شووراو تەتەڵەو بێژنگدانی ڕاوبۆچوونەکان فەرزێکی ئیسلامییەو، بنەمایەکی بەرزو نەگۆڕەو، تادنیا دنیابێ شکۆمەندارترو پرشنگدارتر دەبێ، وە پێویستە گوێ بۆ

الجزء الخامس والعشرون — سورة الشورى

وَمِنْ ءَايَٰتِهِ ٱلْجَوَارِ فِى ٱلْبَحْرِ كَٱلْأَعْلَٰمِ ﴿٣٢﴾ إِن يَشَأْ يُسْكِنِ ٱلرِّيحَ
فَيَظْلَلْنَ رَوَاكِدَ عَلَىٰ ظَهْرِهِۦٓ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ
﴿٣٣﴾ أَوْ يُوبِقْهُنَّ بِمَا كَسَبُوا۟ وَيَعْفُ عَن كَثِيرٍ ﴿٣٤﴾ وَيَعْلَمَ ٱلَّذِينَ
يُجَٰدِلُونَ فِىٓ ءَايَٰتِنَا مَا لَهُم مِّن مَّحِيصٍ ﴿٣٥﴾ فَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَىْءٍ فَمَتَٰعُ
ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ
يَتَوَكَّلُونَ ﴿٣٦﴾ وَٱلَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلْإِثْمِ وَٱلْفَوَٰحِشَ وَإِذَا مَا
غَضِبُوا۟ هُمْ يَغْفِرُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ
وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣٨﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَابَهُمُ
ٱلْبَغْىُ هُمْ يَنتَصِرُونَ ﴿٣٩﴾ وَجَزَٰٓؤُا۟ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا ۖ فَمَنْ عَفَا
وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٠﴾ وَلَمَنِ ٱنتَصَرَ
بَعْدَ ظُلْمِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ مَا عَلَيْهِم مِّن سَبِيلٍ ﴿٤١﴾ إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ عَلَى ٱلَّذِينَ
يَظْلِمُونَ ٱلنَّاسَ وَيَبْغُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ
عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٤٢﴾ وَلَمَن صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ
﴿٤٣﴾ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن وَلِىٍّ مِّنۢ بَعْدِهِۦ ۗ وَتَرَى ٱلظَّٰلِمِينَ
لَمَّا رَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ يَقُولُونَ هَلْ إِلَىٰ مَرَدٍّ مِّن سَبِيلٍ ﴿٤٤﴾

٤٨٧

ئەنجامەکەیشی بگیردرێ و، کاری پێبکرێت، و موسڵمانانیش لە ئەنجامدانی شێوەکەیدا دەتوانن بەپێی بەرژەوەندی ئەو سەردەمەیان دیاریی بکەن ﴿ومما رزقناهم ينفقون﴾ و لەو ڕزق و ڕۆزیەی پێمان داون دەبەخشن لەڕێی خوادا ﴿[٣٩] والذين إذا أصابهم البغي هم ينتصرون﴾ و ئەوکەسانەش کە کاتێ ستەم و ناهەقییەکیان بەرامبەر بکرێت, تۆڵەی خۆیان دەکەنەوە، واتە: تەسلیم و ملکەچی ستەمەکە نابن، و مل داناخەن بۆستەمکاران و، رازی نابن و پێیان ناخۆشە ستەمیان لێ بکرێ، بۆیە ئازایانە خۆ ئامادە ئەکەن ﴿[٤٠] وجزاء سيئة سيئة مثلها﴾ و سزاو تۆڵەی هەر خراپەیەك خراپەیەکی وەك ئەوە بێ زیادەڕەوی. ئەمەیە کە خوا لەسوورەتی ٢/١٩٤دا ئەفەرمووێ: (فمن اعتدی علیکم فاعتدوا علیه بمثل مااعتدی علیکم..) یان دەفەرمووێ: (وان عاقبتم فعاقبوا بمثل ماعوقبتم به..)١٦/١٢٦.

بەڵێ.. دوو جۆر لێبوردن هەیە: یەکێکیان دەبێتە هۆی دامرکاندنەوەی فیتنەو ئاژاوەی ناوخۆ، ئەمە کارێکی زۆر چاك و پەسەندە، ئەوی تریشیان: دەبێتە هۆی جورئەت و هەڵنانی ستەمکاران بۆ درێژە پێدانی ستەم، ئەمەیان زۆر ناپەسەندەو نابێ عەفوو بکرێ ,جا لەبارەی یەکەمەکە وە خوا ئەفەرموێ: ﴿فمن عفا وأصلح فأجره على الله﴾ ئینجا هەرکەسێك لەتۆڵەی دەستدرێژیکار چاوپۆشی کردو، پاشانیش نێوان خۆیانیسازدایەوە, ئەوە پاداشتی لای خوایە. بۆ نموونە: خوا بەرانبەر بە بکوژی دەست ئەنقەست (قیصاص)ی داناوە، کەچی لەم ئایەتەدا هەڵی, دەنێت بۆ لێبوردن و عەفوو لێی. ﴿إنه لا يحب الظالمين﴾ بەراستیی خوا ستەمکارانی خۆش ناوێ.﴿[٤١] ولمن انتصر بعد ظلمه﴾ و بەراستی ئەو کەسەی تۆڵەی خۆی کردەوە لە داوای ئەوستەمەی لێیکراوە ﴿فأولئك ما عليهم من سبيل﴾ ئائەوانە خەتابار نابن و هیچ جۆرە رەخنەو گوناهێکیان لەسەر نیە, چونکە ڕێگەیان پێدراوە تۆڵەی خۆیان بکەنەوە ﴿[٤٢] إنما السبيل على الذين يظلمون الناس﴾ بەڵکو خەتا هەر لەسەر ئەوانەیە ستەم لەخەڵکی ئەکەن ﴿ويبغون في الأرض بغير الحق﴾ و دەستدرێژی دەکەن بەناهەق لەزەوییدا ﴿أولئك لهم عذاب أليم﴾ ئا ئەوانە لەپاشە ڕۆژدا ئازارو سزایەکی دەردناکیان بۆ دەبێت ﴿[٤٣] ولمن صبر وغفر إن ذلك لمن عزم الأمور﴾ بەراستی ئەو کەسەی کە دان بەخۆدا دەگرێ و تۆڵە ناکاتەوە و, لەتاوانی ئەم و ئەو دەبوورێ و، بەراستی ئەوەلە کارە(عەزم) لەسەر کراوەکانە لە شەرعدا.

## ڕۆژی ڕەشی تاوانکاران:

﴿[٤٤] ومن يضلل الله فما له من ولي من بعده﴾ هەرکەسێك خوا سەر لێشێواوی بکات "بەهۆی لاریی و، لاساریی خۆیەوە "ئەوە هەرگیز پاش ئەو، هیچ دۆست و یارمەتیدەرێکی نابێ ﴿وترى الظالمين لما رأوا العذاب﴾ وە لەڕۆژی دواییدا کاتێ ستەمکاران سزای دۆزەخ دەبینن, دەبینی ﴿يقولون هل إلى مرد من سبيل﴾ ئەڵێن: ئایا هیچ ڕێگەیەکمان هەیە بگەڕێینەوە، بۆ دونیا تا کارو کردەوەی چاك ئەنجام بدەین؟" ﴿[٤٥] وتراهم يعرضون عليها﴾ دەیان بینی لە سەرئاگر ڕادەنوێرێن ﴿خاشعين من الذل﴾ بەسەر کزیی, لە زەبوونی و بێ دەسەڵاتییدا ﴿ينظرون من طرف خفي﴾ لەترسانا لەبنەوەبۆ ئار ئەڕوانن و" ناوێرن بەتەواوی تەماشای بکەن" ﴿وقال الذين آمنوا﴾ ئەوانەش کە بڕوایان هێناوە لەڕۆژی قیامەتدا ئەڵێن: ﴿إن الخاسرين الذين خسروا أنفسهم وأهليهم يوم القيامة﴾ بێگومان زیانمەندانی ڕاستەقینە هەرئەوانەن کە خۆیان و ژن و منداڵیان لەدەست داوەو زیانیان کردووە لە ڕۆژی قیامەتدا" ﴿ألا إن الظالمين في عذاب مقيم﴾ هۆشیار بن! کە ئەو ستەمکارانە لەو ڕۆژەدا لەسزایەکی هەمیشەییدان ﴿[٤٦] وما كان لهم من أولياء ينصرونهم من دون الله﴾ وە جگە لەخواش هیچ پشتیوان و دۆست و یارمەتیدەرێکیان نیە کە لە

سزای ئەو رزگاریان بکات ﴿ومن يضلل الله فما له من سبيل﴾ وە هەرکەسێکیش خوا گومڕای بکات بەهۆی سەرپێچی خۆیەوە هیچ رێگەیەکی بۆ نییە تا خۆی دەرباز بکات.

**بەرلە هاتنی قیامەت فریای خۆتان بکەون:**

﴿[٤٧] استجيبوا لربكم من قبل أن يأتي يوم لا مرد له من الله﴾ وەڵامی داخوازییەکانی پەروەردگارتان بدەنەوە پێش ئەوەی رۆژێك بێت کە لەلای خواوە هیچ گەڕانەوەی بۆ نیە ﴿مالكم من ملجأ يومئذ﴾ کە ئەو رۆژە ئیتر هیچ پەناگایەکتان بۆ نابێت خۆتان پەنا بدەن ﴿ومالكم من نكير﴾ وحەشاتان پێناکرێت، چونکە خوا چواردەورەی گرتوون. ﴿[٤٨] فإن أعرضوا فما أرسلناك عليهم حفيظا﴾ جا ئەگەر ئەوانە لەگەڵ ئەو هەموو هەوڵەدا هەرروویان وەرگێڕاو گوێیان بۆ نەگرتیت ئەی محمد! ﷺ خەمبار مەبە، چونکە ئێمە تۆمان نەناردووە چاودێری کاریان بێ و، زۆریان لێ بکەیت بۆ بڕوا هێنان ﴿إن عليك إلا البلاغ﴾ تۆ هەر راگەیاندنەکەت لەسەرە ﴿وإنا إذا أذقنا الإنسان منا رحمة فرح بها﴾ وە ئێمە کاتێ رەحمەت و بەهرەیەك لەلایەن خۆمانەوە بەمرۆڤ بچێژین, لەخۆی بایی ئەبێ! ﴿وإن تصبهم سيئة بما قدمت أيديهم﴾ خۆ ئەگەر بەهۆی ئەو کارانەوە کردوویانە تووشی بەڵاو ناخۆشیەك بوون ﴿فإن الإنسان كفور﴾ جا بێگومان دەبینیت کە مرۆڤ زۆر سپڵەیەو نازو نیعمەتەکان نکوڵی ئەکا و "هەموو چاکەو پیاوەتیەکی لەبیر ئەچێتەوە, وەك پێغەمبەر ﷺ بەخێزانەکانی خۆی فەرموو: ((يا معشر النساء! تصدقن فاني رأيتكن أكثر أهل النار)) ئەی کۆمەڵی ژنان! هەمووتان خێرو صەدەقەو چاکە بکەن، چونکە لەشەوی میعراجدا ئێوەم بە بەشی زۆری دۆزەخ دیت، لەوانە ژنێ وتی: بۆچی ئەی پێغەمبەری خوا! فەرمووی: ((لأنكن تكثرن الشكاية، وتكفرن العشير، لو أحسنت إلى أحداهن الدهر ثم تركت يوما، قالت: ما رأيت خيرا منك قط)) متفق عليه. مسلم: ٨٦/١. چونکە ئێوە سکاڵاتان زۆرەو هەردەم ئینکاری چاکەی مێردتان ئەکەن، خۆ ئەگەر بەدرێژایی رۆژگار لەتەك ژنێکتانا چاکە بکرێت، بەڵام تەنها رۆژێ وازی لێ بهێنی بەمێردەکەی ئەڵێ: قەت من خێرم لێت نەدیتووە. ﴿[٤٩] لله ملك السموات والأرض﴾ خاوەنێتی ئاسمانەکان و زەویی تەنیا هەر بۆ خوایە ﴿يخلق ما يشاء﴾ هەر چی بۆی دروستی ئەکات ﴿يهب لمن يشاء إناثا﴾ بە هەرکەسێك کە خۆی بیەوێ تەنها مێینەو کچ ئەبەخشێ (ئیمامی بەغەوی) ئەڵێ: وەك لووگ/ عليه السلام)" کەسیش ناتوانێ بیگۆڕێ و بیکات بەکوڕ" ﴿ويهب لمن يشاء الذكور﴾ وە بەهەر کەسیش کە خۆی ئارەزووی ببێ تەنها کوڕی ئەداتێ، وەك (ئیبراهیم/ عليه السلام) ﴿[٥٠] أو يزوجهم ذكرانا وإناثا﴾ یان ئەگەر بیەوێ کچ و کوڕیان ئەداتێ وەك (موحەممەد/ عليه الصلاة والسلام) ﴿ويجعل من يشاء عقيما﴾ وە ئارەزوویشی لەهەرکەسێك ببێ، نەزۆکی دەکا، وەك (یەحیا/ عليه السلام)"

الجزء الخامس والعشرون — سورة الشورى

وَتَرَىٰهُمْ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا خَٰشِعِينَ مِنَ ٱلذُّلِّ يَنظُرُونَ
مِن طَرْفٍ خَفِيٍّ ۗ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِنَّ ٱلْخَٰسِرِينَ ٱلَّذِينَ
خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَأَهْلِيهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ أَلَآ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ
فِى عَذَابٍ مُّقِيمٍ ﴿٤٥﴾ وَمَا كَانَ لَهُم مِّنْ أَوْلِيَآءَ يَنصُرُونَهُم
مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۗ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن سَبِيلٍ ﴿٤٦﴾ ٱسْتَجِيبُوا۟
لِرَبِّكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ يَوْمٌ لَّا مَرَدَّ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ ۚ مَا لَكُم
مِّن مَّلْجَإٍ يَوْمَئِذٍ وَمَا لَكُم مِّن نَّكِيرٍ ﴿٤٧﴾ فَإِنْ أَعْرَضُوا۟
فَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا ۖ إِنْ عَلَيْكَ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ۗ وَإِنَّآ إِذَآ
أَذَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِنَّا رَحْمَةً فَرِحَ بِهَا ۖ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌۢ
بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ فَإِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ كَفُورٌ ﴿٤٨﴾ لِّلَّهِ مُلْكُ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ۚ يَهَبُ لِمَن يَشَآءُ إِنَٰثًا
وَيَهَبُ لِمَن يَشَآءُ ٱلذُّكُورَ ﴿٤٩﴾ أَوْ يُزَوِّجُهُمْ ذُكْرَانًا وَإِنَٰثًا ۖ
وَيَجْعَلُ مَن يَشَآءُ عَقِيمًا ۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌ قَدِيرٌ ﴿٥٠﴾ ۞ وَمَا كَانَ
لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ ٱللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَآئِ حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ
رَسُولًا فَيُوحِىَ بِإِذْنِهِۦ مَا يَشَآءُ ۚ إِنَّهُۥ عَلِىٌّ حَكِيمٌ ﴿٥١﴾

٤٨٨ — وكذلك أوحينا

ئیتر ئەو کاتە ژن و پیاو هەرگیز قابیلی وەبەرهێنانی منداڵ نابن" ﴿إنه علیم قدیر﴾ بەراستی زانینی خوا دەوری هەموو شتێکی داوە , بە توانایە لەسەر کردنی هەر کارێ بیەوێ بیکات.

**چۆنیەتی هاتنی وەحیی و وەرگرتنی:**

﴿[٥١] وما كان لبشر ان يكلمه الله إلا وحيا﴾ بۆ هیچ کەسێك نەبووە کەخوا لەروو قسەی لەگەڵ بکات, مەگەر لەرێگەی وەحیەوە، یا بەشێوەی خەو، یان بەخورپە (ئیلهام) ﴿او من وراء حجاب﴾ یان لەپشت پەردەوە، وەك گفتوگۆکەی لە گەڵ موسادا, ئیمامی (ترمزی) و (ئیبن ماجە) لە (جابیری کوڕی عەبدوڵلا)وە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەرﷺ پێی وت: ((ما كلم الله أحدا إلا من وراء حجاب، وإنه كلم أباك كفاحا)). خوای گەورە لەپشت پەردەوە نەبێ هەرگیز قسەی لەگەڵ هیچ کەسێکا نەکردووە، وە کەقسەشی لەگەڵ باوکتا کردووە، لەبەر ئەوەبوو کە لەرۆژی (ئوحود)دا کوژراوەو شەهید کراوە. ﴿او يرسل رسولا فيوحي بإذنه ما يشاء﴾ یان فریشتەیەك وەك جوبریل بنێرێت، تا بەفەرمانی خوا چی بوێ رایبگەیەنێت پێی, ئەم ئایەتە وەڵامە بۆ کافرەکانی مەککە کە گوتیان (لولا يكلمنا الله أو تأتينا آية). ﴿إنه على حكيم﴾ بەراستیی ئەوخوایەکی بڵندە بەسیفاتی بەسەر دروستکاوەکانەوە, گوتارو کردار بەجێیە ﴿[٥٢] وكذلك اوحينا إليك روحا من امرنا﴾ هەروەك بۆ پەیامبەرانی پێشین وەحیمان کرد، ئاوایش ئەم قورئانەمان بۆتۆ وەحی کرد,بەبڕیارو فەرمانی خۆمان و, رۆح و گیان و ئەقڵ دەژێنێتەوە. ﴿ما كنت تدري ما الكتاب ولا الإيمان﴾ تۆ لە پێش وەحی نەتئەزانی کتێب و بڕوا چیە؟ ﴿ولكن جعلناه نورا نهدى به من نشاء من عبادنا﴾ بەڵام ئێمە ئەو قورئانەمان کردە نوورو رووناکییەك, تا بەهۆی ئەوەوە هەرکەسێکمان بوێت لە بەندەکانمان رێنموومایی بکەین، کەوابوو چ قورئان، چ بڕوا هەردوو بەهرەی خوان ﴿وإنك لتهدى إلى صراط مستقيم﴾ بێگومان تۆ ئەی موحەممەد! ﷺ بۆ رێگەیەکی راست خەڵکی رێنوێنی دەکەیت. ﴿صراط الله الذى له مافى السموات وما فى الأرض﴾ رێگە خوایەك کە هەرچی لەئاسمانەکان لەزەویدایە هی ئەوەو, لەژێر دەسەڵاتی ئەودایە ﴿ألا إلى الله تصير الأمور﴾ هۆشیاربە! کە هەمووکارێك هەربۆلای ئەوخوایە ئەگەڕێتەوە, ئەوکاتە ئیتر هەق و ناهەق لێك جیا ئەکرێتەوەو پاداشت و تۆڵەیش وەر دەگیردرێ.

کاتژمێر (٢٠:١٠) لە (١٤١٧/٥/٢٥/٢٤) ك بەرامبەر بە (١٩٩٦/٧/٦) ز لەنووسینی سوورەتی (شوورا) بوومەوە, (لە راگەیاندنی ناوەندیی بزووتنەوە) لە هەڵەبجە. زۆر سوپاس و منەت بۆ خوای دلۆڤان.

*** *** ***

## ٤٣- سوورەتی ( زوخروف ) لە مەککەییەو ( ٨٩ ) ئایەتە

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

ئەم سوورەتە باسی بیروباوەڕو ئایدۆلۆژیەت و پەیام و زیندوو بوونەوەو پاداشت و تۆڵە ئەکات. جا بۆ یەکەم جار سەرچاوەی وەحی روون دەکاتەوە لەگەڵ راستیی قورئاندا، پاشان هەندێ لەنیشانەو بەڵگەکانی دەسەڵاتی خوا نیشان ئەدات، ئینجا هەندێ لەباوو نەریتی جاهیلیەت و سەردەمی نەزانیی و بت پەرستن و هەندێ کاری گەندەڵی تردەخاتە روو، کورتەیەکیش لە باسی بانگەوازەکەی ئیبراهیم عليه السلام و، ئینجا داستانەکەی موساو فیرعەون.. کۆتاییشی بەباسی هەندێ لە گیروگرفتەکانی رۆژی قیامەت دێت.

بەم شێوەیەش دەست پێ ئەکات: ﴿بسم الله الرحمن الرحیم * [١] حم﴾ ئەم پیتانە هێمـای ئیعجازی قورئـانن
﴿[٢] والکتاب المبین﴾ سوێنـد بەم قورئانـە کە ئاشکراو نمایـانەو، روون کەرەوەی ئەحکام و بڕیارەکانی خوایـە
﴿[٣] إنا جعلناه قرآنا عربیا﴾ بێگومان ئێمە کردمان بە خوێندنەوەیەکی شێوە زمان عەرەبیی ﴿لعلکم تعقلون﴾ تا
بەڵکو لە ماناو مەبەستەکەی تێبگەن و،خۆتانی پێ ببستنەوە ﴿[٤] وإنه فی أم الکتاب لدینا لعلی حکیم﴾ بەراستیی
ئەو قورئانە لەدایکی کتێب (لوح المحفوظ)دایە لە لای خۆمان, بەزە بەسەر هەموو کتێبە ئاسمانیەکانی تردا، پڕ
حیکمەت وپڕ وردەکارییە ﴿[٥] افنضرب عنکم الذکر صفحا﴾ باشە، دەکرێ ئێمە بێدارتان نەکەینەوە بەم قورئانـە
﴿أن کنتم قوما مسرفین﴾ لەبەر ئەوەی کە ئێوە گەلێکی لاروو وێرو لەسنوور دەرچوون؟ "نەشتی وا ناکەین، بەڵکو
ئێمە هەر ئامۆژگارییتـان ئەکەین، ئەگەرچی ئاواشبن لە بەر
ئیقامـەی بەڵگـە لەسـەرتان ﴿[٦] وکم ارسلنا من نبی فی
الأولین﴾ ئێمـە پێغەمبـەرێکی زۆرمـان ناردۆتـە لای گـەلانی
پێشـوو "هـەر وەك تـۆ نێرراویتـە لای ئەمانـە. ﴿[٧] وما یأتیهم
من نبي إلا کانوا به یستهزئون﴾ لەگـەڵ ئەوەیشـدا هـەر وە
هیچ پەیامبەرێکمان بۆ نەچووە,مەگـەر گاڵتـەیان پێکردووە,
کەچـی لەگـەڵ ئەوەیشـدا ئێمـە یـەك لـەدوای یـەك
هەرپێغەمبەرانمـان نـاردوو ئارامیشـیان گـرت ﴿[٨]
فأهلکنا أشد منهم بطشا﴾ جائەوانـەش کـە زۆر بەهەڵمـەت
تـرو بـەهێزتر بـوون (لـەقورەیش) لـەناومان بـردن، پـاش
ئینکـاریی و نکۆڵیـان ﴿ومضی مثل الأولین﴾ و نموونـەو
داستانی پێشینەکان تێپەڕیی، کە چیمان پێکردن.

**موشریکەکانیش دەڵێن: خوا ئاسمان و زەوی بە دیهێناوە:**

﴿[٩] ولئن سألتهم من خلق السموات والأرض﴾ ئەگـەر تـۆ
لێیان بپرسیت: کێ ئاسمانەکـان و زەوی دروست کـردووە؟
﴿لیقولن خلقهن العزیز العلیم﴾ بێگومانبە لەوەڵامدا ئەڵێن:
خوای بەتواناو زانا بەدیهێناون، کەچی هەر بتان دەپەرستن"
﴿[١٠] الذي جعل لکم الأرض مهدا﴾ هەر ئەو خوایە کە زەویی کردووە بە لانك "و جێگـەی حەوانـەوەتان" ﴿وجعل لکم
فیها سبلا﴾ وە رێگەی هاتو چۆی بۆ پێداکێشاون "لەوشکانیی و، دەریادا ﴿لعلکم تهتدون﴾ تا بەشکو رێ دەر بکەن
و، بەرەو پێداویستییەکانتان رێنماو شارەزا ببن ﴿[١١] والذی نزل من السماء ماء بقدر﴾ وەهەر ئەو خوایەیە کە لە
ئاسمانەوە بەپێی پێویست و ئەندازەیەکی دیاریی کراو ئاوی نارده خوار ﴿فأنشرنا به بلدة میتا﴾ جا ناوچەو سەر
زەویە وشك و مردووەکانمان پێ سەوز و زیندووکردەوە ﴿کذلك تخرجون﴾ ئێوەش هەر ئاوا لە گۆڕدا دەهێنرێنە
دەرێ و، زیندوو ئەکرێنەوە ﴿[١٢] والذی خلق الأزواج کلها﴾ هەر ئەو خوایەیە کە ئەو هەموو جووتەی دروستکردووە،
ئـەوە شیرینە، ئـەوە تالـە، ئـەوە سپیـیە، ئـەوە ڕەشـە، ئـەوە نێـرە، ئـەوە مێـیە ﴿وجعل لکم من الفلك والأنعام ما
ترکبون﴾ وە لـە کەشتیی و وشـتر و وڵاخـی بـەرزەدا بـۆی فەراهـەمهێناون , تـا لـەدەریاو وشـکانیدا سواریان بـبن,

الجزء الخامس والعشرون — سُورَةُ الزُّخْرُفِ

وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ۚ مَا كُنتَ تَدْرِى مَا ٱلْكِتَٰبُ
وَلَا ٱلْإِيمَٰنُ وَلَٰكِن جَعَلْنَٰهُ نُورًا نَّهْدِى بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنْ عِبَادِنَا ۚ
وَإِنَّكَ لَتَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٢﴾ صِرَٰطِ ٱللَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ
مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ أَلَآ إِلَى ٱللَّهِ تَصِيرُ ٱلْأُمُورُ ﴿٥٣﴾

سُورَةُ الزُّخْرُفِ — ترتيبها ٤٣ — آياتها ٨٩

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

حمٓ ﴿١﴾ وَٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴿٢﴾ إِنَّا جَعَلْنَٰهُ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا
لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٣﴾ وَإِنَّهُۥ فِىٓ أُمِّ ٱلْكِتَٰبِ لَدَيْنَا
لَعَلِىٌّ حَكِيمٌ ﴿٤﴾ أَفَنَضْرِبُ عَنكُمُ ٱلذِّكْرَ صَفْحًا
أَن كُنتُمْ قَوْمًا مُّسْرِفِينَ ﴿٥﴾ وَكَمْ أَرْسَلْنَا مِن نَّبِىٍّ فِى
ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٦﴾ وَمَا يَأْتِيهِم مِّن نَّبِىٍّ إِلَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ
﴿٧﴾ فَأَهْلَكْنَآ أَشَدَّ مِنْهُم بَطْشًا وَمَضَىٰ مَثَلُ ٱلْأَوَّلِينَ
﴿٨﴾ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ
خَلَقَهُنَّ ٱلْعَزِيزُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٩﴾ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ
مَهْدًا وَجَعَلَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلًا لَّعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٠﴾

٤٨٩

بۆجێبەجێ کردنی ئیش و کارەکانتان ﴿ ١٣ لتستووا على ظهوره﴾ تا لەسەر پشتیان سەقامگیر بن ﴿ ثم تذكروا نعمة ربكم إذا استويتم عليه﴾ لە پاشا یادی نیعمەتەکانی پەروەردگارتان بکەن و وە بیری خۆتانی بێننەوەو بەدڵ سوپاسی بکەن ﴿ وتقولوا سبحان الذى سخر لنا هذا﴾ وبڵێن پاك و خاوێنە ئەو خوایەی کە ئەمەی بۆ رام کردووین, تا ئاوا ئێمە بتوانین سوودیان لێ وەرگرین ﴿ وما كنا له مقرنين﴾ وە ئێمە دەسەڵاتی رامکردنیانمان نەبوو ﴿ ١٤ وإنا إلى ربنا لمنقلبون﴾ ئێمە بێگومان هەر بۆلای پەروەردگارمان ئەگەڕێینەوە، دوای مردنمان (عەبدوڵلای کوڕی عومەر) دەڵێ: هەرکاتێ پێغەمبەر ﷺ سواری وڵاخەکەی دەبوو، سێ جار (الله اكبر)ی دەکردو پاشان ئەی فەرموو: ((سبحان الذي سخر لنا هذا وما كنا له مقرنين وإنا إلى ربنا لمنقلبون)) , دوای ئەوەیش ئەیفەرموو: ((اللهم إني أسألك في سفري هذا البر والتقوى، ومن العمل ماترضى، اللهم هون علينا السفر، واطولنا البعد، اللهم أنت الصاحب في السفر والخليفة في الأهل، اللهم اصحبنا في سفرنا واخلفنا في أهلنا)). وە کاتێکیش کە دەگەڕایەوە بۆ ناو ماڵو منداڵی ئەیفەرموو: ((آيبون تائبون إن شاء الله عابدون لربنا حامدون)) مسلیم، ئەبوو داوود، نەسائی، ئەحمەد.

**درێوی شەریك دانان بۆ خوا:**

﴿ ١٥ وجعلوا له من عباده جزءا﴾ لەپێشەوە ددانیان بەوەدا نا کە هەر خوایە ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە.. کەچی هەر لە بەندەکانی خوا خۆی, منداڵیان بۆ بڕیاردا!! وتیان: فریشتەکان کچی خوان! ﴿ إن الإنسان لكفور مبين﴾ بەڕاستیی ئادەمیی سپڵەیەکی ئاشکرایە ﴿ ١٦ ام اتخذ مما يخلق بنات واصفاكم بالبنين﴾ ئایا لەناو ئەوانەدا کە خۆی دروستیکردوون, کچی داناوە بۆ خۆیو، ئێوەی بە کوڕان تایبەتمەند کردووە؟! ﴿ ١٧ وإذا بشر احدهم بما ضرب للرحمن مثلا﴾ کەچی هەرکات یەکێ لەوانە مژدەی کچی درابایە کە بۆ خوای بە بەزەیی بەوێنە دەهێنایەوە ﴿ ظل وجهه مسودا وهو كظيم﴾ دەم و چاوو ڕوومەتی ڕەش هەڵدەگەڕاو، لەرکان پیشی دەخواردەوە! ﴿ ١٨ او من ينشأ فى الحلية﴾ ئایا کەسێك لەنێوخشڵ و زینەتدا پەروەردە کرابێت , واتە: کیژ ﴿ وهو فى الخصام غير مبين﴾ ولەکاتی دەمەقرەدا دەسەڵاتی نادیاربێت, بۆ خوا دەبێت؟! بەڵێ کام ئافرەت هەیە لەکاتی بڕینەوەی کێشەکاندا وەك پێویست بتوانێ بەڕێك و پێکی بەرگری لە خۆی بکا، ئافرەت بە پێی سروشتی خۆی زۆر حەزی لە خشڵ و زێڕو خۆ ڕازاندنەوەو خۆ ئارایشت دانە، هەر بۆیەش لە هەموو سەردەمێك دا ژنان وادەبینرێن، تەنانەت ئێستاش کە سەدەی گەواهی نامەو زانستە، ژنە خاوەن شەهادەکانیش هەروانە! لەلایەکی دیکەشەوە ژنان زۆر کەم بتوانن لەکاتی ڕوو بەڕوو بوونەوەی جەنگ و کێشەدا مافی خۆیان ڕوون بکەنەوە و بەرگری لەخۆیان بکەن، چونکە یان ناوێرن، یان (عاطفە)ی خۆیان زاڵ دەبێ بەسەریانداو گریەو زاری لێیان تێك دەدات. ﴿ ١٩ وجعلوا الملائكة الذين هم عباد الرحمن

الجزء الخامس والعشرون — سُورَةُ الزُّخْرُفِ

وَٱلَّذِى نَزَّلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءًۢ بِقَدَرٍ فَأَنشَرْنَا بِهِۦ بَلْدَةً مَّيْتًا
كَذَٰلِكَ تُخْرَجُونَ ﴿١١﴾ وَٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَزْوَٰجَ كُلَّهَا وَجَعَلَ
لَكُم مِّنَ ٱلْفُلْكِ وَٱلْأَنْعَٰمِ مَا تَرْكَبُونَ ﴿١٢﴾ لِتَسْتَوُۥا عَلَىٰ ظُهُورِهِۦ
ثُمَّ تَذْكُرُوا نِعْمَةَ رَبِّكُمْ إِذَا ٱسْتَوَيْتُمْ عَلَيْهِ وَتَقُولُوا سُبْحَٰنَ
ٱلَّذِى سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقْرِنِينَ ﴿١٣﴾ وَإِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا
لَمُنقَلِبُونَ ﴿١٤﴾ وَجَعَلُوا لَهُۥ مِنْ عِبَادِهِۦ جُزْءًا إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ
لَكَفُورٌ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾ أَمِ ٱتَّخَذَ مِمَّا يَخْلُقُ بَنَاتٍ وَأَصْفَىٰكُم
بِٱلْبَنِينَ ﴿١٦﴾ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِمَا ضَرَبَ لِلرَّحْمَٰنِ مَثَلًا
ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴿١٧﴾ أَوَمَن يُنَشَّؤُا فِى
ٱلْحِلْيَةِ وَهُوَ فِى ٱلْخِصَامِ غَيْرُ مُبِينٍ ﴿١٨﴾ وَجَعَلُوا ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ
ٱلَّذِينَ هُمْ عِبَٰدُ ٱلرَّحْمَٰنِ إِنَٰثًا أَشَهِدُوا خَلْقَهُمْ سَتُكْتَبُ
شَهَٰدَتُهُمْ وَيُسْـَٔلُونَ ﴿١٩﴾ وَقَالُوا لَوْ شَآءَ ٱلرَّحْمَٰنُ مَا عَبَدْنَٰهُم
مَّا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ إِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ ﴿٢٠﴾ أَمْ ءَاتَيْنَٰهُمْ
كِتَٰبًا مِّن قَبْلِهِۦ فَهُم بِهِۦ مُسْتَمْسِكُونَ ﴿٢١﴾ بَلْ قَالُوٓا
إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّهْتَدُونَ ﴿٢٢﴾

وَكَذَٰلِكَ مَآ أَرْسَلْنَا ٤٩٠

إناثا﴾ ئەو فریشتانەش کە هەموو بەندەی خوای بەخشندەن, بە کچی خوایان دادەنان! ﴿اشهدوا خلقهم﴾ ئایا ئەوانە کاتێ خوا دروستی کردن لەوێ بوون؟! (ستکتب شهادتهم ویسألون) بەڕاستی ئەو گەواهییە ناهەقیەیان لەسەر ئەنووسرێو, لەنامەی کارەکانیاندا پرسیاریان لێدەکرێت" لەڕۆژی قیامەتدا ﴿[20] وقالوا لو شاء الرحمن ما عبدناهم﴾ وە دەڵێن: ئەگەر خوای میهرەبان ویستبای ئێمە هەرگیز نەمان ئەپەرستن, واتە: مادام خوا ویستی بووە, دیارە ڕازییە! ﴿مالهم بذلك من علم﴾ بۆئەو بڕو بیانوەشیان هیچ جۆرە زانست و بەڵگەیەکیان نیە ﴿إن هم إلا یخرصون﴾ هەر لەخۆیانەوەو بەدرۆو پڕو پاڵانتە قسە ئەکەن.﴿[21] أم اتیناهم کتابا من قبله﴾ یاخۆ ئێمە لەپێش قورئاندا نامەیەکمان بەوان داوە, پشتگیری بتپەرستیەکەیان بکا ﴿فهم به مستمسکون﴾ جا ئەوان دەستی پێوە گیر بکەن؟ واتە: ئایا ئەوانە بەڵگەیەکی نەقڵییان هەیە بۆ قسەکانیان ﴿[22] بل قالوا إنا وجدنا آباءنا على أمة﴾ نەخێر, بەڵکو هیچ بەڵگەیەکیان نیە، ئەوە نەبێ کە ئەڵێن: ئێمە باوو باپیرانمان لەسەر ئایین و مەزهەبێکی ئاوادیوە ﴿وإنا على آثارهم مهتدون﴾ بەڕاستی ئێمەیش بەشوێن ڕێبازی ئەواندا ڕێنموون ئەبین وهەنگاو هەڵ ئەگرین ﴿[23] وکذلك ما ارسلنا من قبلك في قرية من نذير﴾ وەبەو تەرزەی ئەمانە, هەر پەیامبەرێکی ترسێنەرمان – لەپێشتەوە– ناردووە بۆ شارێك ﴿إلا قال مترفوها﴾ خۆشگوزەرانەکانیان بەگوێیان نەکردووەو وتویانە: ﴿إنا وجدنا آباءنا على أمة﴾ بەڕاستیی ئێمە باوو باپیرانمان دیتووە لە سەرمەزهەب و ئایینێك (وإنا على آثارهم مقتدون) و ئێمەیش بە شوێن ئەواندا ئەڕۆین و پێڕەویان ئەکەین ﴿[24] قال أولو جئتكم بأهدى مما وجدتم عليه آباءكم﴾ پێغەمبەرەکەش وتوویەتی: باشە ئەگەر من بەرنامەو ئایینێکی باشترم لەوەی باوو باپیرانتان بۆ هێنان ئێوە هەر نکوڵی ئەکەن؟! ﴿قالوا إنا بما أرسلتم به کافرون﴾ لەوەڵامدا وتوویانە: بێگومان ئێمە بەو بەرنامەی ئێوە پێی نێرراون باوەڕناکەین! ﴿[25] فانتقمنا منهم﴾ ئینجا ئێمەش تۆڵەمان لێ ساندن﴿فانظر کیف کان عاقبة المکذبین﴾جاسەرنج بدە, بزانەدەرەنجامی بێ باوەڕان وبەدرۆخەرەوان چۆن بوو؟

سُورَةُ الزُّخْرُفِ — الجُزْءُ الخَامِسُ وَالعِشْرُونَ

وَكَذَٰلِكَ مَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَآ
إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقْتَدُونَ ﴿٢٣﴾
۞ قَٰلَ أَوَلَوْ جِئْتُكُم بِأَهْدَىٰ مِمَّا وَجَدتُّمْ عَلَيْهِ ءَابَآءَكُمْ قَالُوٓا۟
إِنَّا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٢٤﴾ فَٱنتَقَمْنَا مِنْهُمْ فَٱنظُرْ كَيْفَ
كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿٢٥﴾ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦٓ
إِنَّنِى بَرَآءٌ مِّمَّا تَعْبُدُونَ ﴿٢٦﴾ إِلَّا ٱلَّذِى فَطَرَنِى فَإِنَّهُۥ سَيَهْدِينِ
﴿٢٧﴾ وَجَعَلَهَا كَلِمَةًۢ بَاقِيَةً فِى عَقِبِهِۦ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٢٨﴾ بَلْ
مَتَّعْتُ هَٰٓؤُلَآءِ وَءَابَآءَهُمْ حَتَّىٰ جَآءَهُمُ ٱلْحَقُّ وَرَسُولٌ مُّبِينٌ ﴿٢٩﴾
وَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلْحَقُّ قَالُوا۟ هَٰذَا سِحْرٌ وَإِنَّا بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٣٠﴾ وَقَالُوا۟
لَوْلَا نُزِّلَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنَ ٱلْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ ﴿٣١﴾ أَهُمْ
يَقْسِمُونَ رَحْمَتَ رَبِّكَ نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُم مَّعِيشَتَهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ
ٱلدُّنْيَا وَرَفَعْنَا بَعْضَهُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَٰتٍ لِّيَتَّخِذَ بَعْضُهُم
بَعْضًا سُخْرِيًّا وَرَحْمَتُ رَبِّكَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴿٣٢﴾ وَلَوْلَآ
أَن يَكُونَ ٱلنَّاسُ أُمَّةً وَٰحِدَةً لَّجَعَلْنَا لِمَن يَكْفُرُ بِٱلرَّحْمَٰنِ
لِبُيُوتِهِمْ سُقُفًا مِّن فِضَّةٍ وَمَعَارِجَ عَلَيْهَا يَظْهَرُونَ ﴿٣٣﴾

الحزب ٥٠

٤٩١

**بەرائەتی ئیبراهیم لە بتەکان و ڕاگەیاندی یەکخواپەرستیی:**

﴿[26] وإذ قال إبراهيم لأبيه وقومه﴾ ئەو کاتە وەبیر بێنە ئەی موحەممەد ﷺ کە ئیبراهیم بە باوك و گەلەکەی خۆی وت: ﴿إنني براء مما تعبدون﴾ بێگومان من لەو خوایانەی کە ئێوە ئەیانپەرستن, بێزارو بەریم ﴿[27] إلا الذي فطرني فإنه سيهدين﴾ جگە لەو خوایەی کە دروستیکردووم، جابە ڕاستی ئەویش ڕێنموونیم ئەکات بۆ ڕێگەی ڕاست و دروست ﴿[28] وجعلها کلمة باقية في عقبه لعلهم يرجعون﴾ کارێکی کرد کە ئەو وشەیە, (وشەی یەکخواپەرستیی) – پاش خۆیشی– لە نەوەکانییدا هەر بمێنێت , تا بەڵکو بگەڕێنەوە بۆلای خوا.. بەڵێ پەیامبەران

و پەیڕەوانیان , هەردەم هەوڵیان داوە بۆ چەسپاندنی وشەی (لا إله إلا الله)، دەبێ پاش خۆشیان هەر ئەوە لەسەر زارو لەناو دڵی پەیڕوان و نەوەکانیاندا بێ ﴿[٢٩] بل متعت هؤلاء وآباءهم﴾ خۆ من ئەوان هاوبەش دانەرەکانی مەککەو، باوو باپیرانیانیشم بەهرەوەر کرد بەجۆرەها نیعمەت و بەخشش ﴿حتى جاءهم الحق ورسول مبين﴾ تا(قورئان) و پەیامبەرێکی ئاشکراو نمایانیان بۆهات ﴿[٣٠] ولما جاءهم الحق﴾ وەکاتێ هەق و ڕاستیی(قورئان)یان بۆهات ﴿قالوا هذا سحر﴾ وتیان ئەمە جادووە!﴿وإنا به كافرون﴾ بەڕاستیی ئێمە بڕوامان پێی نیە ﴿[٣١] وقالوا لولا نزل هذا القرآن على رجل من القريتين عظيم﴾ بیانوویەکی تریان گرت و ووتیان: بۆچی ئەم قورئانە بۆ پیاوێکی گەورەی دەوڵەمەندی ئەم دووشارە مەککەو تائیف نەهاتە خوار؟ بۆچی خوا (وەلیدی کوڕی موغیرە)ی مەککەیی‌و (عوروەی کوڕی مەسعود)ی (سەقەفیی) لەتائیفدا نەکرد بە پەیامبەر؟ کە خاوەنی سەروەت و سامانن! دیارە تەرازووی هەموو حەقیقەتێك لای جاهیلیەت گەورەیی و سەروەت و دارایی‌و هێز و دەسەڵاتە! ﴿[٣٢] أهم يقسمون رحمة ربك﴾ ئایا ئەوانە ڕەحمەت و میهرەبانیی پەروەردگارت بەش ئەکەن؟! تا پەیامبەرێتیش بەدەست ئەوان بێت؟! ﴿نحن قسمنا بينهم معيشتهم في الحياة الدنيا﴾ لەکاتێکدا ئێمە بەحیکمەتی خۆمان گوزەرانیانمان لە نێوانیاندا لە ژیانی دنیادا بەشکردووە، واتە: تەنانەت ژیانی دونیاشیان کە شتێکی بێ نرخە، بەدەستی خۆیان نیە، چ جای بەخشینی ڕەحمەتی پەیامبەرێتی ﴿ورفعنا بعضهم فوق بعض درجات﴾ وە هەندێکیانمان بەرز کردۆتەوە بەسەر هەندێکیاندا بەچەندین پلە لە ماڵ وسامان ودەسەلاّت ﴿ليتخذ بعضهم بعضا سخريا﴾ بۆ ئەوەی هەندێکیان، هەندێکی‌تر بکەنە بەرکار لەکارو باریاندا, واتە: یەکتر بەکار بێنن لە ئیش و کاری خۆیاندا و, سوود لەلێهاتوویی ئەزموونی یەکتر وەرگرن، چونکە ئەگەر هەموویان سەروەتمەندو، لەهەموو شتێکدا وەك یەك وابن، ئەو کاتە ئیش و کار ناڕواو ئەوەستێ، خۆ ناشکرێ مەردوم هەمووی ئەندازیار،یان پزیشك،یا نانەوابێ.. هتد ﴿و رحمة ربك خير مما يجمعون﴾ وە ڕەحمەت و میهرەبانی پەروەردگاری تۆ, لەتەواوی ئەوەی ئەوان کۆی ئەکەنەوە, لەسەروەت و دارایی دونیا باشترە.

**زێڕ و زیوی زۆر, نیشانەی ڕەزامەندی خوا نییە :**

﴿[٣٣] ولو لا أن يكون الناس أمة واحدة﴾ ئەگەر لە بەر ئەوە نەبا کەخەڵکی هەمووبووبان بە یەك گەلی کافر ﴿لجعلنا لمن يكفر بالرحمن لبيوتهم سقفا من فضة﴾ ئەوەندە ماڵ وسامانمان دەدا بەو کەسەی کە باوەڕی بەخوای بەبەزەیی نەبوایە کەمیچی خانووەکانیان لەزیو بوایە ﴿ومعارج عليها يظهرون﴾ وە پلەو قادرمەی زێڕمان بۆ دادەنان تا پێی سەرکەون ﴿[٣٤] ولبيوتهم أبوابا و سررا عليها يتكئون﴾ سەرەڕای ئەوەش هەموو دەرگاو تەختێکمان بۆ ماڵەکانیان لە زیو دادەنا کە لەسەر ئەو تەختانە دانیشن و پاڵ بدەنەوە ﴿[٣٥] وزخرفا﴾ وە بەهەموو نەخش و نیگارێکی جوان خانووەکانیانمان دەڕازاندەوە ﴿وإن كل ذلك لما متاع الحياة الدنيا﴾ وە ئەوهەمووە هەر زرق و برقی ژیانی دنیایە ﴿والآخرة عند ربك للمتقين﴾ ماڵی ئەولاش لای پەروەردگارت هەر بۆ پارێزکارانە واتە: ژیانی ئەم دونیایە ئەوەندە بێ‌نرخەو،.. ئەوەندە سووکە کەئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە جیهان هەمووی بێ بڕوا بوایە لەبەر خۆشگوزەرانیی، هەموویمان ئەبەخشی بە بێ بڕوایان، (پێشەوا عمر کاتێ پێغەمبەری دیت ﷺ کەلەسەر حەسیرێ ڕمڵاویی ڕاکشابوو ئاسەواری لە تەنیشتیەوە دیارە گریاو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەوە کیسراو قەیسەرە، ئەویش گوزەرانی تۆیە!! پێغەمبەر ﷺ شانی دادابوو دانیشت و فەرمووی: ئایا لەگومانایت کوڕەکەی خەتاب؟! پاشان فەرمووی: ئەوانە هەر لەم دونیایەدا خوای گەورە نازو نیعمەت و ڕۆزی خۆیانی پێداون! وە لەڕیوایەتێکی

تردا هاتووە: ((اما ترضی أن تكون لهم الدنيا ولنا الآخرة))، واتە: مەگەر بەوە ڕازی نیت کە دونیا بۆ ئەوان بێ، قیامەتیش بۆ ئێمە؟! تەفسیری ئیبن کەسیر (مسلم:٢/١١٠).

**مەترسی پشتکردن لە خوا:**

﴿٣٦ ومن يعش عن ذكر الرحمن﴾ هەرکەسێك لەڕاست یادی خوا ڕوو وەرگێڕێ ﴿نقيض له شيطانا﴾ ئەوا ئێمە شەیتانێکی بۆ دەسازێنین ﴿فهو له قرين﴾ هەردەم هاوڕێی دەبێت و، لێی جیا نابێتەوە ﴿٣٧ وإنهم ليصدونهم عن السبيل﴾ بەڕاستیی ئەو شەیتانانە پێشگیرییان دەکەن لە ڕیچکە ﴿ويحسبون انهم مهتدون﴾ وایش ئەزانن کە بۆ ڕاستەڕێ ڕێنموونیکراون!! ﴿٣٨ حتى إذا جاءنا﴾ تا ئەو کاتە بەزنجیر کراوی لەگەڵ هاوڕێکەی دێنە لامان ﴿قال يا ليت بينى وبينك بعد المشرقين﴾ ئەوحەلە بەهاوەڵەکەی ئەڵێ: خۆزگە نێوان من و تۆ بەقەدەر نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوا دووربا ﴿فبئس القرين﴾ بەڕاستیی هاوڕییەکی زۆر خراپ بوویت ﴿٣٩ ولن ينفعكم اليوم إذ ظلمتم انكم في العذاب مشتركون﴾ ئینجا پێیان ئەوترێ، ئیتر ئەمڕۆ ئەو قسانە هیچ سوودێکتان پێ ناگەیەنێ، لەکاتێکدا ستەمتان لەخۆ کرد، ئێستا بەڕاستی هەموو پێکەوە هاوبەشین لە سزاکەدا ﴿٤٠ افانت تسمع الصم﴾ جائایا تۆ بەکەڕان ڕاستیی دەبیستێ؟ ﴿او تهدى العمى ومن كان فى ضلال مبين﴾ یاخۆ کوێران و ئەو کەسانەی لە گومڕایی ئاشکرادان ڕێنمایی دەکەیت؟ هەرگیز ناتوانی ئاوا بکەیت، جا کەواتە دڵگران مەبە ئەگەر بڕواشیان نەهێنا ﴿٤١ فإما نذهبن بك﴾ ئینجا ئەگەر تۆ لەم ناوە لابەین و بتمرێنین "پێش ئەوە کاتی خۆی بێت ﴿فإنا منهم منتقمون﴾ بێگومان هەر تۆڵەیان لێ وەر ئەگرین ,ئەگەر دوای مردنی تۆیش بێت ﴿٤٢ او نرينك الذى وعدناهم﴾ یان ئەگەر حەزبکەیت ئەو هەڕەشەو سزایەی بەڵێنمان پێدابوون نیشانتی بدەین و بەچاو بیبینی,ئەوا نیشانت دەدەین ﴿فإنا عليهم مقتدرون﴾ چونکە ئێمە بەسەریاندا زاڵین و لەدەستمان دەرناچن.

سُورَةُ الزُّخْرُف — الجزء الخامس والعشرون

وَلِبُيُوتِهِمْ أَبْوَٰبًا وَسُرُرًا عَلَيْهَا يَتَّكِـُٔونَ ﴿٣٤﴾ وَزُخْرُفًا وَإِن
كُلُّ ذَٰلِكَ لَمَّا مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةُ عِندَ رَبِّكَ
لِلْمُتَّقِينَ ﴿٣٥﴾ وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ ٱلرَّحْمَٰنِ نُقَيِّضْ لَهُۥ شَيْطَٰنًا
فَهُوَ لَهُۥ قَرِينٌ ﴿٣٦﴾ وَإِنَّهُمْ لَيَصُدُّونَهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَيَحْسَبُونَ
أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ ﴿٣٧﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَنَا قَالَ يَٰلَيْتَ بَيْنِى وَبَيْنَكَ
بُعْدَ ٱلْمَشْرِقَيْنِ فَبِئْسَ ٱلْقَرِينُ ﴿٣٨﴾ وَلَن يَنفَعَكُمُ ٱلْيَوْمَ
إِذ ظَّلَمْتُمْ أَنَّكُمْ فِى ٱلْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ ﴿٣٩﴾ أَفَأَنتَ تُسْمِعُ
ٱلصُّمَّ أَوْ تَهْدِى ٱلْعُمْىَ وَمَن كَانَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٤٠﴾
فَإِمَّا نَذْهَبَنَّ بِكَ فَإِنَّا مِنْهُم مُّنتَقِمُونَ ﴿٤١﴾ أَوْ نُرِيَنَّكَ ٱلَّذِى
وَعَدْنَٰهُمْ فَإِنَّا عَلَيْهِم مُّقْتَدِرُونَ ﴿٤٢﴾ فَٱسْتَمْسِكْ بِٱلَّذِىٓ أُوحِىَ
إِلَيْكَ إِنَّكَ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٤٣﴾ وَإِنَّهُۥ لَذِكْرٌ لَّكَ وَلِقَوْمِكَ
وَسَوْفَ تُسْـَٔلُونَ ﴿٤٤﴾ وَسْـَٔلْ مَنْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رُّسُلِنَآ
أَجَعَلْنَا مِن دُونِ ٱلرَّحْمَٰنِ ءَالِهَةً يُعْبَدُونَ ﴿٤٥﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا
مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِي۟هِۦ فَقَالَ إِنِّى رَسُولُ
رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٦﴾ فَلَمَّا جَآءَهُم بِـَٔايَٰتِنَآ إِذَا هُم مِّنْهَا يَضْحَكُونَ ﴿٤٧﴾

وَمَا نُرِيهِم — ٤٩٢

**دەستت لە بەرنامەکەی خوا توند بناڵێنە:**

﴿٤٣ فاستمسك بالذى أوحى إليك﴾ کەوابوو دەست بگرە بەو قورئانەی وەحیکراوە بۆت ئەی موحەممەد! ﷺ ﴿إنك على صراط مستقيم﴾ چونکە تۆ لەسەر ڕێگەو ڕێبازێکی ڕاستی ﴿٤٤ وإنه لذكر لك ولقومك﴾ بێگومان ئەم قورئانە شەرەف و ناوو شۆرەتێکی گەورەیە بۆ خۆت و بۆ هۆزەکەت، چونکە بەڕاستیی هەر بەقورئان سەریان بەرز دەبێ، ئەوەتە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمووێ: ((إن الأمر فى قريش لا ينازعهم فيه أحد إلا أكبه الله على وجهه ماأقاموا الدين)) فتح البارى. بەڕاستیی ئەم کارە, واتە: ویلایەتی موسڵمانان هەر لەنێو قورەیشدا دەبێ تا ئەوان ئایینی خوا ڕابگرن، هەرکەسێك بەر بەرەکانێیان لەگەڵ بکات, خوا بەدەما ئەیخات. ﴿وسوف تسألون﴾ وە لەئایندەشدا

پرسیارتان دەربارەی قورئان لێ ئەکرێ: چیتان کرد سەبارەت بەو بەهرە گەورەیە؟ ﴿٤٥ وسئل من ارسلنا من قبلك من رسلنا﴾ تۆ لـە ئوممەتانی پەیامبەرانێـك بەرلە تۆ ,نـاردراون بپرسـە: ﴿اجعلنا من دون الرحمن آلهة يعبدون﴾ ئایا جگە لەخوای بەخشندە, بڕیارماندا بوو خوا گەلێ بپەرسترێ؟ واتە پەیامبەران هەموو یەك دەنگن بۆ یەکخواپەرستیی و دوور گرتن لە شێوازی بت پەرستیی,دیارە هیچ پێغەمبەرێك نەنێردراوە.

**موساش بە نیشانە گەلێ, چوو بۆ لای فیرعەون:**

﴿٤٦ ولقدْ ارسلنا موسى بآياتنا إلى فرعون وملائه﴾ بێگومان ئێمە موسامان نارد بە چەند موعجیزەیەکەوە بۆلای فیرعەون و پیاوەگەورەکانی مەملَکەتەکەی ﴿فقال إنى رسول رب العالمين﴾ ئینجا چووو پێیگوتن: بەراستیی من نێردراوێکی خوای پەروەردگاری جیهانەکانم بۆ لای ئێوە, ئـەوانیش داوای موعجیزەیـان لێکـرد ﴿٤٧ فلمـا جـاءهم بآياتنـا﴾ جـا هـەر کـە موسـا بەبەڵگەکانمانـەوە (دارە دەستەکەیی و,دەستە سپیەکەیی و..) هاتە لایان ﴿إذا هم منها يضحكون﴾ لـەناکاو کـە بینیـانن, بینیـانن دەخـەنین و,گاڵتەیان لێدەهات ﴿٤٨ وما نريهم من آية إلا هى اكبر من اختها﴾ ئێمە هـەر ئایـەت و مۆجیزەیـەکی خۆمـان نیشـانی ئـەوان دەدا، لـە نیشـانەکەی پێشـەوە گـەورەترو گـرنگتر بـوو ﴿واخذناهم بالعذاب﴾ کەچی هەر بڕوایان نەهێناو ئێمـەیش بەسـزا قارمـان لێگـرتن, بـە سـزایەك کەلـە ئایـەتی(١٣٠) ی(ئەعراف)دا دیـارییکراوە ﴿لعلهم يرجعون﴾ تـا بـەڵکو بـۆ ڕێی راست بگەڕێنەوە و پەشیمان ببنەوە ﴿٤٩ وقالوا يا ايها الساحر أدع لنا ربك بما عهد عندك إننا لمهتدون﴾ جا کاتێ سزاکەیان دیت و تووش بوون ـلە باتی ئەوە کە بڕوا بێنن- وتیـان: ئـەی مامۆسـتای زانـا! ئـەی جادووگـەر! نـزا بکـە، لەپەروەردگارت داوا بکە بەو پەیمانەی کە بەتۆی داوە, با سزامان لەسەر هەڵگرێ، ئەوسا دڵنیابە پاش لابردنی سزاکە ئێمە ڕێی هیدایەت ئەگرین! ﴿٥٠ فلما كشفنا عنهم العذاب﴾ جاکاتێ سزاکەمان لەسەر لابردن ﴿إذا هم ينكثون﴾ کتوپڕ پەیمانەکەیان شکان وبڕوایان نەهێنا.

سُورَةُ الزُّخْرُفِ — الجُزْءُ الخَامِسُ وَالعِشْرُونَ

وَمَا نُرِيهِم مِّنْ ءَايَةٍ إِلَّا هِىَ أَكْبَرُ مِنْ أُخْتِهَا وَأَخَذْنَٰهُم بِٱلْعَذَابِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٤٨﴾ وَقَالُواْ يَـٰٓأَيُّهَ ٱلسَّاحِرُ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِندَكَ إِنَّنَا لَمُهْتَدُونَ ﴿٤٩﴾ فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُمُ ٱلْعَذَابَ إِذَا هُمْ يَنكُثُونَ ﴿٥٠﴾ وَنَادَىٰ فِرْعَوْنُ فِى قَوْمِهِۦ قَالَ يَـٰقَوْمِ أَلَيْسَ لِى مُلْكُ مِصْرَ وَهَـٰذِهِ ٱلْأَنْهَـٰرُ تَجْرِى مِن تَحْتِىٓ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٥١﴾ أَمْ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْ هَـٰذَا ٱلَّذِى هُوَ مَهِينٌ وَلَا يَكَادُ يُبِينُ ﴿٥٢﴾ فَلَوْلَآ أُلْقِىَ عَلَيْهِ أَسْوِرَةٌ مِّن ذَهَبٍ أَوْ جَآءَ مَعَهُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ مُقْتَرِنِينَ ﴿٥٣﴾ فَٱسْتَخَفَّ قَوْمَهُۥ فَأَطَاعُوهُ إِنَّهُمْ كَانُواْ قَوْمًا فَـٰسِقِينَ ﴿٥٤﴾ فَلَمَّآ ءَاسَفُونَا ٱنتَقَمْنَا مِنْهُمْ فَأَغْرَقْنَـٰهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٥٥﴾ فَجَعَلْنَـٰهُمْ سَلَفًا وَمَثَلًا لِّلْـَٔاخِرِينَ ﴿٥٦﴾ ۞ وَلَمَّا ضُرِبَ ٱبْنُ مَرْيَمَ مَثَلًا إِذَا قَوْمُكَ مِنْهُ يَصِدُّونَ ﴿٥٧﴾ وَقَالُوٓاْ ءَأَٰلِهَتُنَا خَيْرٌ أَمْ هُوَ مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلًۢا بَلْ هُمْ قَوْمٌ خَصِمُونَ ﴿٥٨﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا عَبْدٌ أَنْعَمْنَا عَلَيْهِ وَجَعَلْنَـٰهُ مَثَلًا لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٥٩﴾ وَلَوْ نَشَآءُ لَجَعَلْنَا مِنكُم مَّلَـٰٓئِكَةً فِى ٱلْأَرْضِ يَخْلُفُونَ ﴿٦٠﴾

ربع الحزب ٥٠

٤٩٣

**فیرعەون بای هەوایی و یاخیی بوو:**

﴿٥١ ونادى فرعون فى قومه﴾ و فیرعەنیش جاڕیدا بەناو گەلەکەیدا ﴿قال ياقوم اليس لى ملك مصر﴾ وتی: ئەی قەوم و هۆزم! ئایا وڵاتی میسر هی من نیەو, من پاشای (میصر) نیم؟ ﴿وهذه الأنهار تجرى من تحتى﴾ و ئەم هـەموو جۆگـەو ڕووبارانـەش بـە بـەردەم کۆشـکەکەمدا دەچـن؟! ﴿افلا تبصرون﴾ دەئایـا نـابینن؟! مـن لـە چ دەستەڵاتێکدام؟ مووساش چەندە هەژار و بێ دەسەڵات!! ﴿٥٢ ام انا خير من هذا الذى هو مهين﴾ بەڵکی من چاکترم لەکەی لاوازە, من خاوەنی دارایيم، موسایش بێ چارەو هەژار، ئایا کاممان شیاوین؟!! ﴿ولا يكاد يبين﴾ لەوانەش

نیە بتوانێ مەبەستی خۆی بە رەوانی روون بکاتەوە ,فیرعەون مەبەستی لەوگرییەبوو کە لەزمانی مووسادابووو لە کاتی ئاخاوتندا دەگیردرا, بۆدواییش خوا لایبرد ﴿٥٣ فلولا القی علیه أسورة من ذهب﴾ جا بۆچی لەلایەن پەروەردگاریەوە دەستبەندو بازنی زێری نادرێتێ؟ چونکە بازنی ئاڵتوون, نیشانەی گەورەییبووە لای ئەوان دیارە پاشا فیرعەونیەکان باویان وابووە کە بازن و دەستبەندی زێریان لەدەست کردووە، بۆیە ئەو رەخنەیەش لەو دەگرن، بەڵام پەیامبەران ئەیانەوێ ئەو یاسایە هەڵوەشێننەوەو ئەو سامانە بگێڕنەوە بۆ جێی راستەقینەی خۆی ﴿او جاء معه الملائکة مقترنین﴾ یان بۆچی کۆمەڵێ فریشتە لەگەڵیا نەهاتوون؟! یارمەتی بدەن.

**فیرعەون زانی قەومەکەی سوکن، بەنی لێ توند کردنەوە:**

﴿٥٤ فاستخف قومه فأطاعوه﴾، جا فیرعەون بەم قسانە قەومەکەی خرۆشاندو هەڵیخەڵەتاندن ﴿إنهم کانوا قوما فاسقین﴾ بەراستیی ئەوانە گەلێکی فاسق و تاوانبارو لەسنوور دەرچوو بوون، بۆیە فیرعەون سواری سەریان بوو و گومڕایکردن!! ﴿٥٥ فلما آسفونا﴾ جا کاتێ توڕەیان کردین بەکارە خراپەکانیان ﴿انتقمنا منهم﴾ تۆڵەمان لێسەندن ﴿فأغرقناهم اجمعین﴾ هەموویانمان لە (نیل)دا خنکاند. ئیمامی (ئەحمەد) ئەم فەرموودەیە دێنێت: ((إذا رأیت الله – عزوجل– یعطی العبد ماشاء وهو مقیم علی معاصیه فإنما ذلك استدراج منه له، ثم تلا: فلما آسفونا انتقمنا منهم فأغرقناهم أجمعین). واتە:کاتێ دیتت خوا دەبەخشێ بەبەندە ,هەرچی حەز بکات، لەهەمان کاتیشدا بەردەوام بوو لەسەر گوناح و تاوان، ئەوە بەراستیی(ئیستدراج)ەو وردە وردە سەر خستنیەتی و و بەخۆی نازانێ، تا تۆڵەی لێدەکاتەوە، پاشان ئەو ئایەتەی: (فلما آسفونا..)ی خوێندەوە. ﴿٥٦ فجعلناهم سلفا ومثلا للآخرین﴾ جاکردمانن بە پێشینەو, پەندو عیبرەت بۆ خەڵکانی پاش خۆیان، هەتاکەسێکی تر لەرێی ئەوانەوە نەڕوا ﴿٥٧ ولما ضرب ابن مریم مثلا﴾ ئەو دەمەش کە کوڕەکەی مەریەم "عیسا" بەنموونە باسکرا. (عەبدوڵڵای زبعری) نموونەیەکی هێنایەوەو وتی: ئایا ئێمەو پەرستراوەکانمان و خەڵکی تر وەك ئێمە دەچنە دۆزەخەوە! جا خۆ ئەگەر ئەو قسە وابێ دەبێ عیساو فریشتەکانیش هەر بچنە دۆزەخەوە! ﴿إذا قومك منه یصدون﴾ لەناکاو هۆزەکەت لەونموونەیەی (زبعری) کردیانە گاڵەو هەرا,جا کاتێ ئەوەیان بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕرایەوە فەرمووی: بەڵێ: هەرکەسێ خۆی پێیخۆشبێ لەباتی خوا بیپەرسترێ، ئەوە لەگەڵ پەرستراوەکەیدا دەچێتە دۆزەخەوە، وە بەراستیی ئەوانە هەر شەیتان دەپەرستن, وەئەوەش فەرمانی بەپەرستنی دابێ، جا خوا (إن الذین سبقت لهم منا الحسنی أولئك عنها مبعدون)١٠١/٢١. ناردە خوارێ. واتە: بێگومان ئەوانەی لە لایەن ئێمەوەپێشتر بڕیاری بەختەوەرییان بۆ دراوە لەدۆزەخ دوور دەخرێنەوە,واتە: ئەگەر چی پەرسترابیشن. ﴿٥٨ وقالوا ءآلهتنا خیر أم هو﴾ وەوتیان: ئایا پەرستراوەکانی ئێمە چاکترن, یان عیسا؟! دە ئەگەر عیسا بڕواتە دۆزەخەوە, دەبا ئێمەیش هەربچینە دۆزەخەوە ﴿ما ضربوه لك إلا جدلا﴾ ئەو نموونەیان هەر بۆ دەمەدەمێ هێنایەوە ﴿بل هم قوم خصمون﴾ بەڵکو ئەوان هۆزێکن هەر دەمبازی دەکەن ﴿٥٩ إن هو إلا عبد انعمنا علیه﴾ عیساش هەربەندەیەکی ئێمە بوو, بەهرەی پێغەمبەریتیمان پێ بەخشی ﴿وجعلناه مثلا لبنی إسرائیل﴾ و کردمانە بەنموونەیەك بۆ نەوەکانی یەعقوب لە سەر دەسەڵاتی خۆمان ﴿٦٠ ولو نشاء لجعلنا منکم ملائکة فی الأرض یخلفون﴾ وە ئەگەر بمان ویستبا هەندێکتانمان دەکردە فریشتە لەزەویدا جێتانی تیا بگرنەوە ﴿٦١ وإنه لعلم للساعة﴾ وە دابەزینی عیسا بۆ زەوی – لەئاسمانەوە– زانینێکە بۆ نزێکی قیامەت و,نزیکی قیامەتی پێدەزانرێت ﴿فلا تمترن بها﴾ جا کەواتە لەهاتنی قیامەت بەگومان مەبن ﴿واتبعونی هذا صراط مستقیم﴾ وەپەیرەوی هەر لەمن بکەن، ئائەمەیە رێ راستەکە ﴿٦٢ ولا یصدنکم الشیطان إنه

لکم عدو مبین﴾ وە با شەیتان ڕێگەی هەقتان لێ نەگرێت, چونکە بەراستیی ئەو دوژمنێکی ئاشکراتانە ﴿<sup>٦٣</sup> ولماجاء عیسی بالبینات﴾ کاتێ کە عیساش بەچەندان بەڵگەی ئاشکراوەهاتە لایان ﴿قال قد جئتکم بالحکمة﴾، وتی: بەراستیی بەپێغەمبەرێتیەوە هاتوم ﴿ولأبین لکم بعض الذ تختلفون فیه﴾ وەبۆ ئەوەی هەندێك لەوشتانەتان بۆ ڕوون بکەمەوە, ئێوە ناکۆکن تێیدا! لەکاروباری ئایین و دینتان ﴿فاتقوا الله واطیعون﴾ جاکەوابوو ئێوە لە خوا بترسن و، گوێڕایەڵی من بکەن ﴿<sup>٦٤</sup> إن الله هو ربی وربکم فاعبدوه﴾ چونکە بەراسیتی هەر (الله)یە پەروەردگاری من و پەروەردگاری ئێوەش، جا تەنها هەر ئەو بپەرستن ﴿هذا صراط مستقیم﴾ هەر ئەمەیشە ڕێگە ڕاستەکە, ڕێگای یەکخواپەرستیی، یەك بەرنامەو یەك شەریعەت ﴿<sup>٦٥</sup> فاختلف الأحزاب من بینهم﴾ جا تاقمەکان کێشەیان لە نێوان پەیدا بوو "سەبارەت بە عیسا: یەکێ ئەیوت: عەبدو بەندەی خوایە، کە هەر ئەم قسەیەش ڕاست و دروستە-. یەکێ دیکە ئەیوت: نەخێر، کوڕی خوایە! یەکێ تر ئەیوت: نەخێر، هەر خوایە!!" ﴿فویل للذین ظلموا من عذاب یوم الیم﴾ جاتیاچوون بۆئەوانەی ستەمیان کرد.. لەسزای ڕۆژێکی ئێش پێگەیەنەر ﴿هل ینظرون إلا الساعة ان تأتیهم بغتة﴾ ئایا ئەوانە جگە لە هاتنی ڕۆژی قیامەت چاوەڕوانی چی تر ئەکەن کە کتوپڕ لێیان ڕوودەداو پێش دێت؟ ئەو کاتە ئەزانن عیسا کوڕی کێیە؟ ﴿وهم لا یشعرون﴾ هەستیش بەخۆ ناکەن تا پەشیمان ببنەوە.

**ڕۆژی قیامەت گشت یاران، بەدەر لە پارێزکاران دەبنە دژی یەك:**

﴿<sup>٦٧</sup> الأخلاء یومئذ بعضهم لبعض عدو إلا المتقین﴾ ئەو ڕۆژە دۆستان هەموو لەو ڕۆژەدا دەبنە دوژمنی یەکتر، پارێزکاران نەبێت ﴿<sup>٦٨</sup> یا عباد لا خوف علیکم الیوم﴾ خوا بانگ دەکاتە بەندەکانی:ئەی بەندەکانم! ئەمڕۆ نەترسێکتان لەسەر نیە ﴿ولا انتم تحزنون﴾ ودڵ زویریش نابن ﴿<sup>٦٩</sup> الذین آمنوا بآیاتنا وکانوا مسلمین﴾ بەندەکانم ئەوانەن کە بەئایەتەکانمان بڕوایان هێناوە، ملکەچی هەر فەرمانی خۆمان بوون ﴿<sup>٧٠</sup> ادخلوا الجنة انتم وازواجکم تحبرون﴾ لە پاشە ڕۆژدا پێیان ئەوترێ: دەبچنە بەهەشتەوە خۆتان و ژنەکانتان، لەوپەڕی کامەرانیی و خۆشحاڵیی و دڵشادیدا ﴿<sup>٧١</sup> یطاف علیهم بصحاف من ذهب واکواب﴾ جا کە نیشتەجێ بوون لەبەهەشتا،کاسەی زێڕینی پڕ لە خواردن و، جامی پڕ لەشەراب بە سەریاندا ئەگەڕێنرێ ﴿وفیها ما تشتهیه الأنفس وتلذ الأعین﴾ هەرچیش دڵ حەزی لێبکا و، چاوچێژی لێ بەرێ تێیدا هەیە ﴿وانتم فیها خالدون﴾ و ئێوەش بە هەتا هەتایی تیایا ئەمێننەوە ﴿<sup>٧٢</sup> وتلك الجنة التی اورثتموها بما کنتم تعملون﴾ پێیان ئەوترێ: ئەمە ئەو بەهەشتەیە کە بەهۆی کارە چاکەکانتانەوە پێتاندراو بەمیرات پێتان بڕا، واتە: مافی خۆتانەوە، پیرۆزتان بێت ﴿<sup>٧٣</sup> لکم فیها فاکهة کثیرة منها تأکلون﴾ میوەی زۆری جۆراو جۆری تێدا هەیە بۆتان لێیان دەخۆن.



وَإِنَّهُۥ لَعِلۡمٞ لِّلسَّاعَةِ فَلَا تَمۡتَرُنَّ بِهَا وَٱتَّبِعُونِۚ هَٰذَا صِرَٰطٞ مُّسۡتَقِيمٞ ٦١ وَلَا يَصُدَّنَّكُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُۖ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ٦٢ وَلَمَّا جَآءَ عِيسَىٰ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ قَالَ قَدۡ جِئۡتُكُم بِٱلۡحِكۡمَةِ وَلِأُبَيِّنَ لَكُم بَعۡضَ ٱلَّذِي تَخۡتَلِفُونَ فِيهِۖ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ٦٣ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ رَبِّي وَرَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُوهُۚ هَٰذَا صِرَٰطٞ مُّسۡتَقِيمٞ ٦٤ فَٱخۡتَلَفَ ٱلۡأَحۡزَابُ مِنۢ بَيۡنِهِمۡۖ فَوَيۡلٞ لِّلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنۡ عَذَابِ يَوۡمٍ أَلِيمٍ ٦٥ هَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّا ٱلسَّاعَةَ أَن تَأۡتِيَهُم بَغۡتَةٗ وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ٦٦ ٱلۡأَخِلَّآءُ يَوۡمَئِذِۭ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوٌّ إِلَّا ٱلۡمُتَّقِينَ ٦٧ يَٰعِبَادِ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡكُمُ ٱلۡيَوۡمَ وَلَآ أَنتُمۡ تَحۡزَنُونَ ٦٨ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُواْ مُسۡلِمِينَ ٦٩ ٱدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ أَنتُمۡ وَأَزۡوَٰجُكُمۡ تُحۡبَرُونَ ٧٠ يُطَافُ عَلَيۡهِم بِصِحَافٖ مِّن ذَهَبٖ وَأَكۡوَابٖۖ وَفِيهَا مَا تَشۡتَهِيهِ ٱلۡأَنفُسُ وَتَلَذُّ ٱلۡأَعۡيُنُۖ وَأَنتُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ٧١ وَتِلۡكَ ٱلۡجَنَّةُ ٱلَّتِيٓ أُورِثۡتُمُوهَا بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ٧٢ لَكُمۡ فِيهَا فَٰكِهَةٞ كَثِيرَةٞ مِّنۡهَا تَأۡكُلُونَ ٧٣

## تاوانباران تا سەر لە دۆزەخدا دەرنایەن:

﴿[٧٤] إن المجرمين في عذاب جهنم خالدون﴾ بێگومان تاوانباران (بەشیرك وكوفر)لەسزای دۆزەخدان بەهەمیشەیی ﴿[٧٥] لا يفتر عنهم﴾ هەرگیز لێیان نابڕێ و سووك ناكرێ ﴿وهم فيه مبلسون﴾ ئەوان لەو سزایەدا بێ ئومێدن ﴿[٧٦] وما ظلمناهم﴾ و ئێمە هیچ ستەممان لێ نەكردوون ﴿ولكن كانوا هم الظالمين﴾ بەڵام ئەوان خۆیان ستەمكار بوون ولەرێگەی ئێمە لایاندا ﴿[٧٧] ونادوا يا مالك﴾ ئەوجا هانا دەبەن بۆ دەرگاوانی دۆزەخ وبانگ دەكەن: ئەی مالیك! ﴿ليقض علينا ربك﴾ باپەروەردگارت بڕیار بدات بۆمان بەمردن ,تا لەو سزایە رزگار ببین. (سەفوان) ئەڵێ: گوێم لە پێغەمبەر ەوە ﷺ لە سەر مینبەر ئەم ئایەتەی: (ونادوا يا مالك ليقض علينا ربك)ی دەخوێندەوە. فتح الباری: ٨/٤٣١. وە لەئایەتی تردا ئەفەرمووێ: (لا يقضى عليهم فيموتوا ولا يخفف عنهم من عذابها..) یان دەفەرمووێ: (ثم لايموت فيها ولا يحيا)١٣/٨٧. ﴿قال إنكم ماكثون﴾ مالیكیش پێیان ئەڵێ: هەر لێرە دەمێنن و رزگار بوونتان بۆ نییە ﴿[٧٨] لقد جئناكم بالحق﴾ خوا لەوەڵامیاندا دەفەرموێ:چونكە بەراستیی كاتی خۆی هەق و راستییمان بۆ هێنان و بۆمان روونكردنەوە ﴿ولكن اكثركم للحق كارهون﴾ بەڵام زۆربەی زۆرتان رقتان لەراستیی و هەقبوو و لێوتان لێ هەڵئەقرچان و وەرتان نەگرت. بێ بڕوایان لە (دار الندوة) دەربارەی لەناو بردنی پێغەمبەر ﷺ كۆ بوونەوە، ئەو جا خوا فەرمووی: ﴿[٧٩] ام ابرموا امرا﴾ بەڵكو كارێكیان سازاند بۆ لەناو بردنی پەیامبەر ﷺ ﴿فإنا مبرمون﴾ بەراستیی ئێمەیش ئەو پیلانە بەسەریاندا دەشكێنینەوە و چاك لێ دەبڕێین بەرامبەر پیلانەكەیان بۆ پشتگیری پەیامبەر ﷺ ﴿[٨٠] ام يحسبون انا لا نسمع سرهم ونجواهم﴾ بەڵكو پێیان وایە كە ئێمە نهێنی و سرتەو چپەیان نا بیستین؟! ﴿بلى ورسلنا لديهم يكتبون﴾ بەڵێ چاك ئەبیستین و فریشتە نێراوەكانیشمان وان لەلایان وكارو كردەشیان ئەنووسن.

الجزء الخامس والعشرون | سُورَةُ الزُّخْرُفِ

إِنَّ ٱلْمُجْرِمِينَ فِي عَذَابِ جَهَنَّمَ خَٰلِدُونَ ﴿٧٤﴾ لَا يُفَتَّرُ عَنْهُمْ وَهُمْ
فِيهِ مُبْلِسُونَ ﴿٧٥﴾ وَمَا ظَلَمْنَٰهُمْ وَلَٰكِن كَانُوا۟ هُمُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٧٦﴾
وَنَادَوْا۟ يَٰمَٰلِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ قَالَ إِنَّكُم مَّٰكِثُونَ ﴿٧٧﴾ لَقَدْ
جِئْنَٰكُم بِٱلْحَقِّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَكُمْ لِلْحَقِّ كَٰرِهُونَ ﴿٧٨﴾ أَمْ أَبْرَمُوٓا۟ أَمْرًا
فَإِنَّا مُبْرِمُونَ ﴿٧٩﴾ أَمْ يَحْسَبُونَ أَنَّا لَا نَسْمَعُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَىٰهُم ۚ بَلَىٰ
وَرُسُلُنَا لَدَيْهِمْ يَكْتُبُونَ ﴿٨٠﴾ قُلْ إِن كَانَ لِلرَّحْمَٰنِ وَلَدٌ فَأَنَا۠ أَوَّلُ
ٱلْعَٰبِدِينَ ﴿٨١﴾ سُبْحَٰنَ رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبِّ ٱلْعَرْشِ
عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٨٢﴾ فَذَرْهُمْ يَخُوضُوا۟ وَيَلْعَبُوا۟ حَتَّىٰ يُلَٰقُوا۟ يَوْمَهُمُ
ٱلَّذِي يُوعَدُونَ ﴿٨٣﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي فِي ٱلسَّمَآءِ إِلَٰهٌ وَفِي ٱلْأَرْضِ
إِلَٰهٌ ۚ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٨٤﴾ وَتَبَارَكَ ٱلَّذِي لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَعِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ
﴿٨٥﴾ وَلَا يَمْلِكُ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِ ٱلشَّفَٰعَةَ إِلَّا مَن
شَهِدَ بِٱلْحَقِّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٨٦﴾ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ
لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ۖ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٨٧﴾ وَقِيلِهِۦ يَٰرَبِّ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ قَوْمٌ
لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٨٨﴾ فَٱصْفَحْ عَنْهُمْ وَقُلْ سَلَٰمٌ ۚ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٨٩﴾

٤٩٥

## خوا منداڵی هەر نییە:

﴿[٨١] قل إن كان للرحمن ولد﴾ بڵێ: گریمان – وەك ئێوە ئەڵێن – ئەگەر خوای بەبەزەیی، منداڵی ببێ ﴿فأنا اول العابدين﴾ ئەوە من یەكەمین كەسم بیپەرستم، چونكە من بەندەیخوام. ﴿[٨٢] سبحان رب السموات والأرض رب العرش عما يصفون﴾ پاكی و بەرزو بڵندیی بۆ پەروەردگاری ئاسمانەكان و زەوی، پەروەردگاری عەرش، دەربارەی ئەو قسە ناقوڵانە ئەوان وەسفی خوای پێ دەكەن: بە راگرتنی منداڵ و..هتد ﴿[٨٣] فذرهم يخوضوا ويلعبوا﴾ جا تۆش جارێ وازیان لێ بێنە باسەر بكەنە قسەی ناقۆڵاو گەمەكەی خۆیان بكەن ﴿حتى يلاقوا يومهم الذي يوعدون﴾ تا دەگەنە ئەو رۆژەی هەڕەشەیان لێكراوەو بەڵێنیان پێدراوە پێی بگەن.

**لە ئاسمان و زەویی، هەر( ألله ) خۆی خوایە :**

﴿^٨٤ وهو الذى فى السماء إله وفي الأرض إله﴾ خوا هەر ئەو زاتەیە کە هەم لەئاسماندا خوایەو پەرستراوە، هەم لەزەویشدا خوایەو پەرستراوە لەلایەن دانیشتوانیەوە ئیتر هیچ کەسێك شایستەی پەرستن نییە ئەو نەبێ.
﴿وهو الحكيم العليم﴾ ئەویشە جوانکاری زانا ﴿^٨٥ وتبارك الذى له ملك السموات والأرض وما بينهما﴾ وە مەزنی لەو خوایەی خاوەنێتی ئاسمانەکان و زەوی و نێوانیان هەر هی ئەوە ﴿وعنده علم الساعة﴾ وەزانینی کاتی قیامەت لای ئەوە ﴿واليه ترجعون﴾ و هەر بۆلای ئەویش دەگێردرێنەوە ﴿^٨٦ ولا يملك الذين يدعون من دونه الشفاعة﴾ وە پەرستراوانەی ئەوان لەباتی خوا هاواریان لێ دەکەن و ئەیانپەرستن دەسەڵاتی شەفاعەت و تکایان نییە ﴿إلا من شهد بالحق﴾ بەڵام کەسێك شایەتی بە هەق دابێ و بڕوای هێنابێت وەك فریشتەکان و عوزەیروعیسا ئەوانە دەتوانن داوای شەفاعەت بکەن ﴿وهم يعلمون﴾ وەئەوان ئەزانن هەقیقەتی شایەدەکەیان ﴿^٨٧ ولئن سألتهم من خلقهم ليقولن الله﴾ خۆ ئەگەر لەخۆشیان بپرسیت کێ دروستی کردوون؟ بەدڵنیاییەکەوە ئەڵێن: خوا﴿فأنى يؤفكون﴾ ئەی ئیتر چۆن لەپەرستنی خوا لادەدەن و روو لەشوێنیدیکە دەکەن؟

**سکاڵای پێغەمبەر ﷺ لای خوا :**

﴿^٨٨ وقيله يارب إن هؤلاء قوم لا يؤمنون﴾ خوا ئاگای لەوتەی پەیامبەرەکەیەتی کە سکاڵا لە گەلەکەی دەکاو ئەڵێ: ئەی پەروەردگاری من! بەراستیی ئەوانە گەلێکن باوەڕ ناهێنن. واتە: ئەو بێ بڕوایانە بۆ ناترسن لەو سکاڵای پەیامبەرە لە سەر بڕوا نەهێنانیان؟.

**تێبینی:** (وقيله) بەژێری لام و هێیەکە، یان بەسەرەی لام و بۆری هێیەکە، بە هەردوو جۆری خوێندنەوەکەی (عطف)ە لەسەر (والساعة) لە (وعنده علم الساعة)دا،خوێندنەوەکەی بە ژێر،بە ئیعتباری (مضاف إليه)، سەرپێدانیشی بە ئیعتیباری ئەوەیەکە لەبنەڕەتدا (مفعول)ە بۆ (علم). ﴿^٨٩ فاصفح عنهم وقل سلام﴾ جاتۆ وازیان لێ بێنەوماڵئاوایییان لێ بکە، دیارەئەم سڵاوەی ئێرە ،واتای جیابوونەوەو لێکدووركەوتنەوەیە، نەك سڵاوی خۆشەویستیو پێکەوە ژیان ﴿فسوف يعلمون﴾ دەساڵەئاییندەدا ئەزانن پاشەرۆژیان چۆنەو چییان بەسەر دێت ، دیارە ئەمەش هەڕەشەیە لێیان.

لە (١٤١٧/٧/٣/٢)ك بەرامبەر بە (١٩٩٦/١١/١٣/١٢)ز لەم سوورەتە بوومەوە, لەکاتژمێر (٧:٥٠) خولەك، لە هەڵەبجەی زامدارو لە راگەیاندنی بزووتنەوە. (ولله الحمد والمنة).

*** *** ***

## ٤٤- سوورەتی ( دخان )لە مەککەییەو ( ٥٩ ) ئایەتە

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

ئەم سوورەتە باسی: خوا بەیەکزانین و، پەیامەکەی پێغەمبەرو، زیندووبوونەوە دەکات. لەسەرەتاوە باسێکی گەورەیی قورئان و پیرۆزیی ئەو شەوە ئەکات کە قورئانی تێدا هاتۆتە خوار، ئینجا هەڵوێستی هاوبەش دانەرەکان سەبارەت بە قورئان روونەدەکاتەوە، پاشان بەسەرهاتەکەی فیرعەون و گەلەکەیی و، وێران بوونی ئەو هەموو باخ و سەوزاییەیان رادەگەیەنێت، کۆتاییشی بەباسی رێ وشوێن و چارەنووسی چاککاران و خراپکاران دێت.

جا بەم شێوەیە دەست پێدەکات: ﴿بسم الله الرحمن الرحیم * ١ حم﴾ ئەم پیتانەو وێنەیان ، بۆدەسەوسانی عەرەبە رەوانبێژو خۆشخوانەکانی سەردەمە, لە پێشیشەوە گەلێ جار قسەیان لێکراوە.

**قورئان شەوی قەدر هاتە خوارێ:**

﴿٢ والکتاب المبین﴾ سوێندم بەم قورئانە ئاشکراو نمایانە،یان سوێند بەو قورئانەی بەیانکەری هەق وناهەقە , راستیی و، ناراستییەکان لە بێژنگ دەدا ﴿٣ إنا انزلناه فی لیلة مبارکة﴾ بێگومان لە شەوێکی ئێجگار پیرۆز "شەوی قەدردا" ناردومانەتە خوار، وەك خوای گەورە ئەفەرمووێ: (إنا أنزلناه في ليلة القدر)١/٩٧. یا ئەفەرمووێ: (شهر رمضان الذي أنزل فيه القرآن)٢/١٨٥. هەندێ لەزانایان پێیان وایە ئەو فەرموودەش کە لەپێغەمبەرەوە ﷺ هێنراوە: (تقطع الآجال من شعبان، حتى أن الرجل ينكح ويولد له، وقد أخرج (إسمه في الموتى)، هەرچەند ئیمامی (تەبەریی و بەیهەقی) ریوایەتیان کردووە، بەڵام -وەك ئیمامی ئیبن کەسیر- ئەڵێ: (والصحيح: إنما هي ليلة القدر على ما بيناه). وە هەروا ئیمامی (ئیبن جەریر) ئەڵێ: (والصواب من القول في ذلك قول، من قال: عني بها ليلة القدر؟. ﴿إنا کنا منذرین﴾ بەڕاستیی ئێمە هەمیشە هەر ترسێنەرو بێدارکەرەوە بووین واتە: مەبەست لە ناردنی ئەم قورئانەدا وشیار کردنەوەو ترساندنی مەردومە ﴿٤ فیها یفرق کل امر حکیم﴾ لەوشەوەدا - قورئانی تێدا هات- هەموو بەرنامەو ئیش و کارێکی گرنگ بڕیار دەدرێ و جیا دەکرێتەوە ﴿٥ امرا من عندنا﴾ هەموو ئەو بڕیارانەش - لەو شەوەدا ئەدرێن- هەموو بەفەرمانی خۆمانە ﴿إنا کنا مرسلین﴾ بێگومان هەر ئێمەشبووین (موحەممەد) و هەموو پێغەمبەران نارد ﴿٦ رحمة من ربك﴾ لەبەر بەزەییەك لەلایەن پەروەردگارتەوە بۆ ئادەمزاد وجنۆکە ﴿إنه هو السمیع العلیم﴾ چونکە هەر ئەوە بیسەری زانا , واتە: هەر ئەوەبیسەرو بە هەموو بیسراوێ, زانا بەهەموو زانراوێ ﴿٧ رب السموات والأرض وما بینهما إن کنتم موقنین﴾ پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەویی‌ونەوشتانەیە لەنێوانیاندایە, ئەگەر ئێوە یەقینتان ببێ ,دە یەقینتان ببێ کە(موحەممەد) پێغەمبەری خوایە ﴿٨ لا إله إلا هو یحیی ویمیت﴾ جگە لەو هیچ پەرستراوێکی هەق نیە, کە ژیان ئەدا ئەمرێنێ, مردن و ژیان بەدەستیی ئەوە ﴿ربکم ورب آبائکم الأولین﴾ پەروەردگاری ئێوەو پەروەردگاری باوانی پێشینیشتانە , واتە:هەر ئەوە کاروبارتان بەڕێوە ئەبات، ئەبێ تەنها هەر ملکەچی ئەویش بن ﴿٩ بل هم فی شك یلعبون﴾ بەڵکو ئەوان لەناو گومانێکدان لە زیندووبوونەوە, گەمە دەکەن ,وەك ئەم ئایەتەش - سەبارەت بە بالادەستی خواو,خاوەنداریێتی جیهانەکان - دەفەرمووێ: (قل ياأيهاالناس إني رسول الله إليكم جميعاالذي له ملك السموات والارض لا إله إلاهو يحي ويميت)٧/١٥٨.



**چاوەڕوانی ڕۆژێ بە ,بە دوکەڵ بەری ئاسمان دەگرێ:**

﴿١٠ فارتقب يوم تأتي السماء بدخان مبين﴾ جاچاوەڕوانی ڕۆژێك بە ئەی موحەممەد! ﷺ كە ئاسمان بەئاشكرا دووكەڵێكی لێ پەیدا دەبێت, لە دەرەنجامی, گرانیی و, قات و قڕیەك سەر لە قورەیش هەڵ ئەداو برسیەتیەكی ترسناك دایان ئەگرێ و، لە بەربرسێتی یەكتر نابینن و ئاسمانیش وەك چرە دووكەڵ دێتە پێش چاویان، دیارە ئەوەیش قاری خوایە، بەتایبەت كە پەیامبەر ﷺ دوعای لە قورەیش كردو فەرمووی: ((اللهم أشدد وطأتك على مضر واجعلها عليهم سنين كسنى يوسف..)) بوخاریی. واتە: خوایە! گرانیی و، قات و قڕییەكی وایان بەسەربدە، هەر وەك گرانیەكەیسالەكانی سەردەمی یوسف. ئەم تەفسیرە- كەتەفسیری (..يوم تأتي السماو بدخان مبين)مان پێكرد- ڕاو بۆچوونی (تەبەریی) و زۆرێك لە ڕاڤەكەرانی قورئان بوو, ئەوەتە (ئیبن جەریر) ئەڵێ: (والصواب فى ذلك ماروى عن ابن مسعود من أن الدخان الذي أمر الله نبيه ﷺ أن يرتقبه، هو ماأصاب قومه من الجهد والجوع حتى أكلوا العظام والميتة). بەڵام (ئیبن عەبباس) -خوا لێیان ڕازی بێت- ئەڵێت: مەبەست بە (دخان)ـەكە, ئەو دوو كەڵەیە,نیشانەیەكە لەنیشانەكانی هاتنی قیامەت. (ئیبن كەسیر)یش ئەمەی پەسەند كردووە و دەڵێت: هەرچەند ئەیشگونجێت ئەوەی یەكەم بێت. ﴿١١ يغشى الناس هذا عذاب أليم﴾ سزا "دووكەڵەكە" هەموو خەڵكیمەككە دەگرێتەوە، هەر كە بینیشیان ئەڵێن:ئەمە سزایەكی ئێش پێگەیەنەرە ﴿١٢ ربنا اكشف عنا العذاب إنا مؤمنون﴾ لەبەرناچاری هاواریان لێ بەرز ئەبێتەوەوئەڵێن: ئەی پەروەردگاری ئێمە! ئەم سزایەمان لەسەر لابەە، بێگومان ئێمە باوەڕ دێنین ﴿١٣ انى لهم الذكرى﴾ جا تازە لەكوێ,یان چۆن بڕوا هێنانی ناچاریی, سوودیان پێدەگەیەنێت؟! ﴿وقد جاءهم رسول مبين﴾ خۆ بەڕاستییپەیامبەرێكی ئاشكرایان بۆ هات پێش سزاكە , بڕوایشیان نەهێنا ﴿١٤ ثم تولوا عنه وقالوا معلم مجنون﴾ پاشان -لەباتی بڕوا هێنان- ڕوویان لێ وەرگێڕاو وتیان: (ئەو محەممەد)ـە فێر كراوێكی شێتە! جا گەلێك بۆچوونی ئاوا بێ, ئیتر چۆن ئامۆژگاری وەر ئەگرێ؟ بۆیە شایستەی ئەو سزایەبوون ﴿١٥ إنا كاشفوا العذاب قليلا إنكم عائدون﴾ جگە لەوە، ئێوە زۆر سپڵەو بێ وەفایشن، چونكە بەڕاستیی ئێمە هەر كەمێك سزاكەتان لەسەر لاببەین, خێرا دەچنەوە سەر كاری خۆتان , واتە:هیچ كات دانامەزرێن و عیبرەت ناگرن ﴿١٦ يوم نبطش البطشة الكبرى﴾ ئەو ڕۆژە وەبیربێنە كە بە توندی هەڵمەتی گەورەی خۆمان دەبەین ﴿إنا منتقمون﴾ بەڕاستیش ئێمە لەڕۆژی دوایی، یان لەڕۆژی (بەدر)دا تۆڵەسێنەرین، جا ئەو كاتە ئیتر بێ پشت و پەنا دەمێننەوەو هیچ كەسێكیان نیە سزایان لەسەر لابات.جا ئەگەر مەبەست بەودووكەڵە,ئەو دووكەڵە بێ یەكێكە لەنیشانەكانی هاتنی قیامەت,وەك (ئیبن عەباس)ڕای وایە,یان مەبەست ئەوگرانیی ونارەحەتیە بێ-وەك تەبەریی دەڵێ- بەری ئاسمانی لێگرتن, ئەوا (عەبدوڵڵای كوڕی مەسعود) (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: (فقد مضى خمسة: الدخان، والروم، والقمر، والبطشة، واللزام/ مخرج فى الصحيحين/ فتح البارى: ٤٣٤/٨.هەر پێنج شتەكە بەدووكەڵەكەیشەوە تێ پەڕین، بەڵام هەندێكی دیكە دەڵێن: هێمان دوو كەڵەكە ڕووینەداوە, وەك ئیمامی (موسلیم) لە ٢٢٢٥/٤دا هێناویەتی: ((لا تقوم الساعة حتى تروا عشر آيات: طلوع الشمس من مغربها، والدخان، والدابة، وخروج يأجوج ومأجوج، وخروج عيسى ابن مريم، والدجال، وثلاثة خسوف: خسف بالمشرق، وخسف بالمغرب، وخسف بجزيرة العرب ونار تخرج من قعر عدن تسوق الناس -أو تحشر الناس- تبيت معهم حيث باتوا، وتقيل معهم حيث قالوا))).
كەوابوو ئەو ڕۆژی هەڵمەتە گەورەیە -وەك ئیمامی تەبەریش دەڵێت- هەر ڕۆژی قیامەتە، هەر ئەمەیش بەهێزە.

## تاقیکردنەوەی قەومەکەی فیرعەون و، دەرەنجامیان:

﴿ ١٧ ولقد فتنا قبلهم قوم فرعون﴾ وە بەهەقیقەت لەپێشیانەوە,واتە: لەپێش (قورەیش)ـە وە گەلی فیرعەونمان
تاقیکردەوە ﴿وجاءهم رسول كريم﴾ و پەیامبەرێکی بەڕێزو گەورەیان موسا ﷺ هاتە لا ﴿ ١٨ ان ادوا إلى عباد الله﴾
پێیگوتن: کە بەندەکانی خوا(بەنی ئیسرائیل) بدەنە دەست من و وازیان لێ بێنن لەگەڵ من بێن , وەك لەجێگایەکی
تردا دەفەرمووێ: (فأرسل معی بنی إسرائیل...). ﴿إني لكم رسول امين﴾ چونکە بەراستیی من پەیامبەرێکی ئەمینم
لەسەرپەیامەکەی خوا بۆتان ﴿ ١٩ وان لا تعلوا على الله﴾ پێتان ئەڵێم: خۆتان بەگەورەو بەرز مەگرن لە سەر خوا,واتە:
سەرپێچی مەکەن و بێ بڕوا مەبن ﴿إني آتيكم بسلطان مبين﴾ چونکە بەڕاستیی من بەڵگەیەکی ئاشکراو روونم بۆ
هێناون ﴿ ٢٠ وإني عذت بربي وربكم ان ترجمون﴾ وە
بەڕاستیی من پەنا دەگرم بە پەروەردگاری خۆم و،
پەروەردگاری ئێوەش, لەوەی کە بەردە بارانم بکەن و
بمکوژن ﴿ ٢١ وإن لم تؤمنوا لي فاعتزلون﴾ خۆ ئەگەر هەر
بڕوام پێناهێنن، ئەوا دوورم لێبگرن و وازم لێ بێنن ﴿ ٢٢ فدعا
ربه ان هؤلاء قوم مجرمون﴾ ئینجا موسا دوای نائومێد
بوونی لە بڕواهێنانیان, داوای کرد لە پەروەردگاری خۆی و
هاواری بۆبردو وتی: خوایە! بەراستیی ئەمانە قەوم و
گەلێکی تاوانکارن ,جا ئیتر تۆش تۆڵەیان لێ بسێنە ﴿ ٢٣
فأسر بعبادي ليلا﴾ دەسا ئیتر ئێمە پێمان وت: با فیرعەون
پێتان نەزانێ, بەبەندەکانمەوە(واتە:بەبەنی ئیسرائیلەوە)
شەو دەرچۆ لە شار ﴿إنكم متبعون﴾ چونکە بەراستیی
ئەوانە دواتان دەکەون ﴿ ٢٤ واترك البحر رهوا﴾ کە
لەدەریاکەش پەڕینەوە, دەریاکە بەجێ بهێڵە بەواڵا کراوی،
تا ئەوانیش بەدواتاندا بێن و بخنکێن ﴿إنهم جند مغرقون﴾
چونکە بەراستیی ئەوانە لەشرکێکی خنکێنراون , واتە:
بڕیاریان بۆ دەرچووە، ئەبێ هەر تیا بچن، جا کاتێ موسا
پەڕییەوەو ویستی بەدار دەستەکەی شوێنەکەی خۆی کوێر بکاتەوە لەترسی فیرعەوندا، خوا فەرمووی: وازی لێ
بێنە، با بێن بەدواتاندا، دیارە چوون و خنکان ﴿ ٢٥ كم تركوا من جنات وعيون﴾ ئەوانە بەجێیان هێشت لە دوای
خۆیان باخ و کانیاوێکی زۆر ﴿ ٢٦ وزروع ومقام كريم﴾ و کشتوکاڵ و جێگاوشوێنی جوان ﴿ ٢٧ ونعمة كانوا فيها
فاكهين﴾ و نازو نیعمەت و بەهرەیەك کە بەخۆشی گوزەرانیان تیا دەکرد ﴿ ٢٨ كذلك﴾ ئاواو بەو شێوەیە لەوانمان
سەندنەوە ﴿وأورثناها قوما آخرين﴾ و ئەو هەموو سەرمایەو دەسەڵاتەی فیرعەونەمان کردە میراتی گەلێکی ترو ,
نەوەکانی یەعقوبمان کردە جێنشین ﴿ ٢٩ فما بكت عليهم السماء والأرض﴾ جا ئاسمان و زەوی شین و زاری نەکردن
, ئەڵبەتە لەناو عەرەباندا باو بووە وتویانە: (بكت عليهم السماء والأرض). (سەعیدی کوڕی جوبەیر) دەڵێ: پیاوێك
لە (ئیبن عەباس)ی پرسی: مانای ئایەتی (فما بكت عليهم السماء والأرض) چییە؟ دەبۆ ئاسمان و زەویی بۆ کەس

الجزء الخامس والعشرون — سورة الدخان

وَأَن لَّا تَعْلُوا عَلَى اللَّهِ إِنِّي آتِيكُم بِسُلْطَانٍ مُّبِينٍ ﴿١٩﴾ وَإِنِّي عُذْتُ
بِرَبِّي وَرَبِّكُمْ أَن تَرْجُمُونِ ﴿٢٠﴾ وَإِن لَّمْ تُؤْمِنُوا لِي فَاعْتَزِلُونِ ﴿٢١﴾ فَدَعَا
رَبَّهُ أَنَّ هَٰؤُلَاءِ قَوْمٌ مُّجْرِمُونَ ﴿٢٢﴾ فَأَسْرِ بِعِبَادِي لَيْلًا إِنَّكُم
مُّتَّبَعُونَ ﴿٢٣﴾ وَاتْرُكِ الْبَحْرَ رَهْوًا إِنَّهُمْ جُندٌ مُّغْرَقُونَ ﴿٢٤﴾ كَمْ
تَرَكُوا مِن جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ ﴿٢٥﴾ وَزُرُوعٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ ﴿٢٦﴾ وَنَعْمَةٍ
كَانُوا فِيهَا فَاكِهِينَ ﴿٢٧﴾ كَذَٰلِكَ وَأَوْرَثْنَاهَا قَوْمًا آخَرِينَ ﴿٢٨﴾
فَمَا بَكَتْ عَلَيْهِمُ السَّمَاءُ وَالْأَرْضُ وَمَا كَانُوا مُنظَرِينَ ﴿٢٩﴾ وَلَقَدْ
نَجَّيْنَا بَنِي إِسْرَائِيلَ مِنَ الْعَذَابِ الْمُهِينِ ﴿٣٠﴾ مِن فِرْعَوْنَ إِنَّهُ
كَانَ عَالِيًا مِّنَ الْمُسْرِفِينَ ﴿٣١﴾ وَلَقَدِ اخْتَرْنَاهُمْ عَلَىٰ عِلْمٍ عَلَى
الْعَالَمِينَ ﴿٣٢﴾ وَآتَيْنَاهُم مِّنَ الْآيَاتِ مَا فِيهِ بَلَاءٌ مُّبِينٌ
﴿٣٣﴾ إِنَّ هَٰؤُلَاءِ لَيَقُولُونَ ﴿٣٤﴾ إِنْ هِيَ إِلَّا مَوْتَتُنَا الْأُولَىٰ وَمَا
نَحْنُ بِمُنشَرِينَ ﴿٣٥﴾ فَأْتُوا بِآبَائِنَا إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٣٦﴾ أَهُمْ
خَيْرٌ أَمْ قَوْمُ تُبَّعٍ وَالَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ أَهْلَكْنَاهُمْ إِنَّهُمْ كَانُوا مُجْرِمِينَ
﴿٣٧﴾ وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَاعِبِينَ ﴿٣٨﴾
مَا خَلَقْنَاهُمَا إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٩﴾

٤٩٧

دەگرین؟ وتی: بەڵێ چونکە هەموو کەسێ لەئاسماندا دەرگایەکی خۆی هەیە، لەو دەرگاوە رزق و نیعمەتی بۆ دێ. هەر لەوێشەوە کارو کردەوەکانی بەرز دەبنەوە، جا کاتێ مرد ئەو دەرگایەی دادەخرێ و ئیتر ئەویش بۆی دەگری! وە هەرکات لەو جێگایە بڕا کە لەزەوییدا سوژدەی تێدا بردووە ئیتر زەویش یادی دەکاو بۆی دەگری! بەڵام قەوم و هۆزەکەی فیرعەون چونکە سوژدەیان نەبردو کردەوەی چاکیان نەبوو، ئاسمان وزەوی نەگریاو بۆیان بەداخ نەبوو. (تەبەریی). ﴿وما كانوا منظرين﴾ وە ساتێکیش مۆڵەت نەدران و دوا نەخران بۆ کاتێکی تر , بەڵکو بەپەلە سزا دران ﴿[٣٠] ولقد نجينا بني إسرائيل من العذاب المهين﴾ بێگومان نەوەکانی یەعقوبمان لەسزای چەوسێنەر رزگار کرد ﴿[٣١] من فرعون إنه كان عاليا من المسرفين﴾ لەچنگی فیرعەونێ، کە دەعیە بازبوو لە زێدە ڕۆیاندا , واتە: تۆیش ئەی موحەممەد!ﷺ گەلەکەت دڵخۆش بکە، کەرزگاریان ئەکەم لەزەبرو زۆری زۆرداران, ئەگەر بڕوای راستەقینەیان هەبێت ﴿[٣٢] ولقد اخترناهم على علم على العالمين﴾ سوێند دەخۆم:بێگومان لەڕووی زانیارییەوە ئەوانمان هەڵبژاردو رێزی ئەوانماندا بەسەر هەموو جیهانی سەردەمی خۆیاندا, بەناردنی پێغەمبەران لەناویاندا و,پێدانی کتێب پێیان ﴿[٣٣] وآتيناهم من الآيات ما فيه بلاء مبين﴾ وەچەندە ئایەت و بەڵگەی گرنگی خۆمانمان پێدان کە تاقیکردنەوەیەکی ئاشکراو روونیان تێدا بوو بۆیان,دەئایا پەیڕەوییان کرد؟!

**قورەیش دەڵێن مردوو زیندوو نابێتەوە!:**

﴿[٣٤] إن هؤلاء ليقولون﴾ بێگومان ئەو بتپەرستانەی مەککە ئەڵێن: ﴿[٣٥] إن هي إلا موتتنا الأولى﴾ مردنێ نیە جگە لە مردنی یەکەمجار ﴿وما نحن بمنشرين﴾ وجارێکی تریش زیندوو ناکرێینەوە ﴿[٣٦] فأتوا بآبائنا إن كنتم صادقين﴾ دەسا ئەگەر راست ئەکەن – وەك خۆتان ئەڵێن – زیندوو بوونەوە هەیە , دەفەرموون باوانەکانمان زیندوو بکەنەوەو بیانهێنن بۆمان ﴿[٣٧] اهم خير ام قوم تبع والذين من قبلهم﴾ ئایاقورەیش چاکترن، یا گەلەکەی(توببەع/ أبو كريب الحميري) پاشای یەمەن,وە ئەوانەی لە پێشیانەوە ژیاون ﴿اهلكناهم﴾ بتپەرستانی هۆزەکەت لەوان بەهێز تر نەبوون, ئەوەتە ئەوانمان بەو هەموو دەسەڵات و توانایانەوە لەناو برد ﴿إنهم كانوا قوما مجرمين﴾ چونکە بەراستیی کۆمەڵێکی تاوانبار بوون , دەی پەندیان لێوەرگرن.

**سەرنجێك:** مێژوو نووسان دەڵێن: ئەم (توببەع)ـە: (٣٢٦)ساڵ پاشایەتی قەوم و هۆزەکەی خۆیکردووە! وە لەنێو هۆزەکەی خۆیدا (هۆزیحیمیەر)لەو قەدو باڵا بەرزتر نەبووە، (٧٠٠) ساڵ پێش لەدایك بوونی پێغەمبەرمان(موحەممەد) مردووە.(ئیبن عەباس ئەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((لا تسبوا تبعا فإنه قد أسلم)) المعجم الكبير للطبراني. واتە: جنێو بە (توببەع) مەدەن، چونکە توببەع موسڵمان بوو. ٢٩٦/١١.

**ئەم بوونەوەرەمان بە گەمە دروستنەکردووە:**

﴿[٣٨] وما خلقنا السموات والأرض وما بينهمالاعبين﴾ ئێمە ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی نێوانیان, بەگاڵتەو گەپ و بێ ئامانج, بەدی نەهێناوە ﴿[٣٩] وما خلقناهما إلا بالحق﴾، بەڵکو هەر بە حەق و راستمان وەدیهێناون ﴿ولكن اكثرهم لا يعلمون﴾ بەڵام زۆربەیان نەزانن، بۆیە مل بە هەق نادەن ﴿[٤٠] إن يوم الفصل ميقاتهم اجمعين﴾ بێگومان رۆژی جیاکردنەوەی هەقدارو ناهەقکار, کاتی بەڵێنی هەموانە سەرجەم ,ئەورۆژە دەزانن چیان بەسەر خۆیاندا هێناوە ﴿[٤١] يوم لايغني مولى عن مولى شيئا﴾ ئەو رۆژە هیچ دۆستێك ناتوانێ کەمترین کۆمەك بەدۆستی خۆی بکات "کەس بەکەس نییە" ﴿ولاهم ينصرون﴾ پشتگیری و یارمەتیش نادرێن ﴿[٤٢] إلا من رحم الله﴾ بەڵام کەسێك خوا رەحمی پێکردبێ لە ئەهلی ئیمان ,یارمەتی دەدرێ ﴿إنه هو العزيز الرحيم﴾ چونکە بەراستیی هەر ئەو(اللە)

دەسەڵاتداری میهرەبان و دڵاوایە. (ئیبن عەبباس/ خوا لێیان رازی بێت) ئەڵێ: پەیامبەران و فریشتەکان لەرۆژی قیامەتدا, بۆ مرۆڤی موسڵمان تکائەکەن.

**ژیانی تاوانباران لە رۆژی سەلادا:**

﴿٤٣ إن شجرة الزقوم * ٤٤ طعام الأثيم﴾ بێگومان داری ژەقنەمووت -کە دارێکی بەروبوو تاڵەو لە (تهامه) شداجۆری ئەو سەوز ئەبێ - خۆراکی تاوانکارە,واتە:مرۆڤی کافرە, چونکە مەبەست بە(أثیم)مرۆڤی کافرە,وەکو لە ئایەتەکانی پاش وپێشی خۆیەوە دەر دەکەوێ ﴿٤٥ كالمهل يغلي في البطون﴾، هەر وەك مسی تواوە لەسکی گوناهباراندا جۆش ئەخواو ئەکوڵێ ﴿٤٦ كغلي الحميم﴾ هەرچۆنێ ئاوی کوڵ بەکوڵ دێتە جۆش, هەرکات دۆزەخیەکان برسییان بوو ,بەری ئەو درەختەیان ئەدرێتێ و، لەسکیاندا وەك ئاوی گەرم ئەکوڵێ ﴿٤٧ خذوه فاعتلوه إلى سواء الجحيم﴾ ئینجا ئەوترێ: ئا دەی ئەو بێ باوەڕە گوناهکارە بگرن و پێشی سەری بگرن رایکێشن بۆ ناوەڕاستی دۆزەخ ﴿٤٨ ثم صبوا فوق راسه من عذاب الحميم﴾ پاشان هەر لەو ئاوە ئێجگار گەرمە بکەن بەسەریا ﴿٤٩ ذق إنك أنت العزيز الكريم﴾ پێی ئەوترێ: دە بچێژە ئەوسزایە، چونکە بەراستیی تۆ دەسەڵاتدارو پیاو ماقوڵ و بەڕێز بوویت لەناو هۆزوو گروهەکەتدا,یان بەلای خۆتەوە!! . ﴿٥٠ إن هذا ماكنتم به تمترون﴾ پێیان ئەوترێ بەڕاستی ئەمە ئەو دۆزەخەیە ئێوە لێی دوودڵ بوون.



إِنَّ يَوْمَ الْفَصْلِ مِيقَاتُهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٤٠﴾ يَوْمَ لَا يُغْنِي مَوْلًى
عَن مَّوْلًى شَيْئًا وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿٤١﴾ إِلَّا مَن رَّحِمَ اللَّهُ
إِنَّهُ هُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ ﴿٤٢﴾ إِنَّ شَجَرَتَ الزَّقُّومِ ﴿٤٣﴾
طَعَامُ الْأَثِيمِ ﴿٤٤﴾ كَالْمُهْلِ يَغْلِي فِي الْبُطُونِ ﴿٤٥﴾ كَغَلْيِ
الْحَمِيمِ ﴿٤٦﴾ خُذُوهُ فَاعْتِلُوهُ إِلَىٰ سَوَاءِ الْجَحِيمِ ﴿٤٧﴾ ثُمَّ
صُبُّوا فَوْقَ رَأْسِهِ مِنْ عَذَابِ الْحَمِيمِ ﴿٤٨﴾ ذُقْ إِنَّكَ
أَنتَ الْعَزِيزُ الْكَرِيمُ ﴿٤٩﴾ إِنَّ هَٰذَا مَا كُنتُم بِهِ تَمْتَرُونَ
﴿٥٠﴾ إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي مَقَامٍ أَمِينٍ ﴿٥١﴾ فِي جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ
﴿٥٢﴾ يَلْبَسُونَ مِن سُندُسٍ وَإِسْتَبْرَقٍ مُّتَقَابِلِينَ ﴿٥٣﴾
كَذَٰلِكَ وَزَوَّجْنَاهُم بِحُورٍ عِينٍ ﴿٥٤﴾ يَدْعُونَ فِيهَا بِكُلِّ
فَاكِهَةٍ آمِنِينَ ﴿٥٥﴾ لَا يَذُوقُونَ فِيهَا الْمَوْتَ
إِلَّا الْمَوْتَةَ الْأُولَىٰ ۖ وَوَقَاهُمْ عَذَابَ الْجَحِيمِ ﴿٥٦﴾ فَضْلًا
مِّن رَّبِّكَ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴿٥٧﴾ فَإِنَّمَا يَسَّرْنَاهُ بِلِسَانِكَ
لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٥٨﴾ فَارْتَقِبْ إِنَّهُم مُّرْتَقِبُونَ ﴿٥٩﴾

سُورَةُ الْجَاثِيَةِ



**سەیران و سەفای پارێزکاران لە بەهەشتدا:**

﴿٥١ إن المتقين في مقام امين﴾ بێگومان پارێزکاران لە جێگایەکی هێمن و ئاسایشدان ﴿٥٢ في جنات وعيون﴾ لەناو چەندان باخ و سەرچاوەدان ﴿٥٣ يلبسون من سندس و إستبرق﴾ لە ببەر ئەکەن لە ئاوریشم و حەریری ناسك وئەستوور ﴿متقابلين﴾ هەموو بەرامبەری یەکن لەکۆڕی دانیشتنەکانیاندا ﴿٥٤ كذلك وزوجناهم بحور عين﴾ هەروا وەسفمانکرد بۆت, هاوجووتمان کردوون, بەژنانێ سپی, چاوگەورە ﴿٥٥ يدعون فيها بكل فاكهة آمنين﴾ داوا دەکەن لەو بەهەشتانەدا هەر جۆرە میوەیەك حەزی لێ بکەن بێ ترس لەمردن و لە هەر شتێکی تر ﴿٥٦ لا يذوقون فيها الموت إلا الموتة الأولى﴾ مەرگی یەکەم - کە لەدونیادا چەشتیان-، ئیتر هیچ مردنێکی تر ناچێژن، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمووێ: ((يؤتى بالموت في صورة كبش أملح فيوقف بين الجنة والنار، ثم يذبح، ثم يقال: يا أهل الجنة! خلود فلا موت، ويا أهل النار! خلود فلا موت))متفق عليه. فتح الباري: ٢٨٢/٨. موسلیم: ٢١٨٨/٤. واتە: مردن لە دیمەنی بەرانێکی شاخداردا ئەهێنرێ و، لەنێوان بەهەشت و دۆزەخدا رادەگیردرێ و سەردەبڕدرێ، لەپاشان بەهەردوو لا دەگوترێ: ئیتر قەت نامرن و هەتا هەتایە ئەوە ژیانتانە!. (جابیر) خوا لێی رازی بێ ئەڵێ: لە پێغەمبەریان پرسی: ئایا بە هەشتی یەکان ئەخەون؟ فەرمووی:

((النوم أخو الموت وأهل الجنه لا ينامون)) رواه الطبراني. خەو برای مردنه، بەڵام بەهەشتیی قەت ناخەون. ﴿ووقاهم عذاب الجحيم﴾ وە لەسزای دۆزەخیش پاراستوونی ﴿٥٧ فضلا من ربك﴾ ئەمەیش زیادە ڕێزێکە لەلایەن پەروەردگارتەوە ﴿ذلك هو الفوز العظيم﴾ ئائەوەشە سەرکەوتنە گەورەکە ﴿٥٨ فإنما يسرناه بلسانك﴾ جا ئێمە ئەو (قورئان)ەمان بەزمانی تۆ بۆ خوێندنەوە ئاسان کرد ﴿لعلهم يتذكرون﴾ بەشکو ئامۆژگاری بگرن ﴿٥٩ فارتقب إنهم مرتقبون﴾ دەسا تۆ چاوەڕوانی بەڵێنەکانی خوا بە، بەڕاستی ئەوانیش چاوەڕوانی تیاچوونی تۆن، دەرەنجامیش هەموو ئەزانن کێ سەرکەوتوو ئەبێ, ئەم هەڕەشەیە بۆ دوپاتکردنەوەیە لە پیشتیوانیکردنی خوا لەپێغەمبەرو بڕوادارەکان.

لە (٤)ی ڕەجەبی (١٤١٧)ك بەرامبەر بە (١٩٩٦/١١/١٥)ز لەنووسینی تەفسیری ئەم سوورەتە بوومەوە لەڕاگەیاندنی ناوەندیی بزووتنەوەی ئیسلامیی لە هەڵەبجەی زامدار، کاتژمێر (١:١٥) خولەك،

زۆر سوپاس بۆ خوای گەورە.

*** *** ***

## ٤٥- سوورەتی ( جاسیە )یە

## مەککەییەو ( ٣٧ ) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتی(جاسیە)ش وەك سوورەتە مەککەییەکانی تر, باوەڕ بەخوا، بە زیندووبوونەوە، بە پەیامەکەی پێغەمبەر, دەچەسپێنێ.

دەشتوانین ئامانجەکانی ئەم سوورەتە لە (٧) خاڵاندا کۆبکەینەوە:

١- گەورەیی قورئان و، گرنگیی لەژیاندا.

٢- چەمکێك لە نیشانەکانی یەکخواپەرستیی.

٣- هەندێ بڕو بیانووی سروشتناسەکان و پووچەڵ کردنەوەی.

٤- هەڕەشەیەکی سەخت , سەبارەت بەو گومڕایانە لە ئاقیدەی دروست لایانداو، ناگەڕێنەوەسەر ڕێگای‌ڕاست.

٥- لێبوردن و چاوپۆشیی.

٦- ئامارژەیەکی کورت بۆ لەزەت و خۆشیی و ڕابواردن لەپاشەڕۆژدا.

٧-ڕووداوەکانی بوونەوەریش هێمای هاتنی قیامەتن.

ئابەم شێوەیەش دەست پێ ئەکات: ﴿بسم الله الرحمن الرحيم * ١ حم﴾ لەپێشەوە مانا کراون ﴿٢ تنزيل الكتاب من الله العزيز الحكيم﴾ ئەم قورئانە لە لایەن خوایەکی بەتوانای کارجوانەوە دابەزێنراوە, هەرچی بکات دەسەڵات و توانای هەیەو، هەموویشی لەجێگای خۆیدایە.

### لە بوونەوەر ورد بنەوەو ببینن:

﴿٣ إن فی السموات والأرض لآيات للمؤمنين﴾ بێگومان لە ئاسمانەکان و زەویدا، بەڵگە گەلێکی بەهێزییان تێدایە بۆ باوەڕداران، لەسەر تاك و تەنیایی خودا ﴿٤ وفی خلقكم وما يبث من دابة﴾ وە لەدروستکردنی ئێوەدا(ئەی ئادەمزاد!) کە بەو هەموو قۆناغەدا تێدەپەڕن و، لەو هەموو گیانلەبەرانەدا کە بەسەر زەویدا بڵاو ئەبنەوە ﴿آيات لقوم يوقنون﴾ گەلێ بەڵگەو نیشانە هەن سەبارەت بە دەسەڵاتی خوا بۆ خەڵکێك کە یەقینیان ببێ بە نیشانەکان ﴿٥

واختلاف الليل والنهار﴾ و لەئاڵو گۆڕو هاتنی شەوو ڕۆژدا ﴿وما أنزل الله من السماء من رزق﴾ و لەو باران و ڕۆزییەی کە خوا لە حەواوە دەینێرێ ﴿فأحيا به الأرض بعد موتها﴾ جا بەهۆی ئەوەوە زەویی زیندوو دەکاتەوە، دوای مردنی، واتە: دوای وشك بوونی ﴿وتصريف الرياح﴾ وە لە هەڵکردن و ئاڵ و گۆڕی بایەکاندا بەرەو باکور، بەرەو باشوور، جاریێ سارد، جاریێ گەرم ﴿آيات لقوم يعقلون﴾ لەوانەدا چەندان ئایەت و نیشانە هەیە بۆ خەڵکانێك ژیریی خۆیان بەکار بێنن و، ورد ببنەوە لەم بوونەوەرەیە. نمونەی ئەم ئایەتانە لەم ئایەتەشدا هاتووە: (إن في خلق السموات والأرض واختلاف الليل والنهار والفلك التي تجري في البحر بما ينفع الناس وماأنزل الله من السماء من ماء فاحيا به الأرض بعد موتها وبث فيها من كل دابة وتصريف الرياح والسحاب المسخر بين السماء والأرض لآيات لقوم يعقلون)٢/١٦٤، بۆ دووپاتی دەسەڵاتی خوای گەورە.

الجزء الخامس والعشرون — سورة الجاثية

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ
حمٓ (١) تَنزِيلُ الْكِتَابِ مِنَ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ (٢) إِنَّ فِي السَّمَاوَاتِ
وَالْأَرْضِ لَآيَاتٍ لِّلْمُؤْمِنِينَ (٣) وَفِي خَلْقِكُمْ وَمَا يَبُثُّ مِن دَابَّةٍ آيَاتٌ
لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ (٤) وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَمَا أَنزَلَ اللَّهُ مِنَ السَّمَاءِ
مِن رِّزْقٍ فَأَحْيَا بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَتَصْرِيفِ الرِّيَاحِ آيَاتٌ لِّقَوْمٍ
يَعْقِلُونَ (٥) تِلْكَ آيَاتُ اللَّهِ نَتْلُوهَا عَلَيْكَ بِالْحَقِّ فَبِأَيِّ حَدِيثٍ بَعْدَ
اللَّهِ وَآيَاتِهِ يُؤْمِنُونَ (٦) وَيْلٌ لِّكُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ (٧) يَسْمَعُ آيَاتِ
اللَّهِ تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ثُمَّ يُصِرُّ مُسْتَكْبِرًا كَأَن لَّمْ يَسْمَعْهَا فَبَشِّرْهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ
(٨) وَإِذَا عَلِمَ مِنْ آيَاتِنَا شَيْئًا اتَّخَذَهَا هُزُوًا أُولَٰئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ
مُّهِينٌ (٩) مِّن وَرَائِهِمْ جَهَنَّمُ وَلَا يُغْنِي عَنْهُم مَّا كَسَبُوا شَيْئًا
وَلَا مَا اتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ أَوْلِيَاءَ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ (١٠) هَٰذَا
هُدًى وَالَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ لَهُمْ عَذَابٌ مِّن رِّجْزٍ أَلِيمٌ (١١)
اللَّهُ الَّذِي سَخَّرَ لَكُمُ الْبَحْرَ لِتَجْرِيَ الْفُلْكُ فِيهِ بِأَمْرِهِ وَلِتَبْتَغُوا مِن
فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ (١٢) وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي
الْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ (١٣)

٤٩٩

﴿٦ تلك آيات الله نتلوها عليك بالحق﴾ ئائەمانە کە بەڵگەی بوون و دەسەڵاتی خوان و ئێمە بۆتۆی ئەخوێنینەوە بە هەق ﴿فبأي حديث بعد الله وآياته يؤمنون﴾ جائیتر پاش خواو بەڵگەکانی ئەوخوایە ئەی قوورەیشی‌یەکان! بەکام قسە بڕوا دەهێنن؟.

## پەسنی مرۆڤی بوختانکەرو

﴿٧ ويل لكل افاك اثيم﴾ سزای هەرە قورس بۆ هەموو درۆزنێکی خراپەکار لە کافرەکانی مەککەو وێنەیان ﴿٨ يسمع آيات الله تتلى عليه﴾ کە ئایاتەکانی خوا ئەبیستێ بەسەریدا دەخوێنرێتەوە ﴿ثم يصر مستكبرا كأن لم يسمعها﴾ دوایی بەهۆی لەخۆبایی بوونیەوە پێدا ئەگرێ لەسەر بێ بڕواییەکەی بەلووتبەرزی، دەڵێی هەر نەیبیستوون! ﴿فبشره بعذاب اليم﴾ جا تۆ بەو کەسەو وێنەی ئەو مزگێنی سزایەکی ئێش پێگەیەنەری پێبدە ﴿٩ و إذا علم من آياتنا شيئا اتخذها هزوا﴾ وە کاتێ شتێکیش لە ئایەتەکانی ئێمە فێر بوو بێ و بزانێ گاڵتەی بەهەموو ئایەتەکان دەکرد. کاتێ باسی (شجره الزقوم) دەکرا (ئەبوجەهل) گاڵتەی ئەکردو ئەیوت: ئەوە کەرێ و خورمایە! ﴿اولئك لهم عذاب مهين﴾ ئا ئەوانە سزایەکی ئابڕو بەرو ریسواکەریان بۆ هەیە بەهۆی ئەو درۆو پڕو پاڵانتەیانەوە ﴿١٠ من ورائهم جهنم﴾ لەبەردەم و لەپشت سەریانەوە دۆزەخ هەیە ﴿ولا يغني عنهم ماكسبوا شيئا﴾ وە هیچ شتێکیان لێ ناگێڕێتەوە ئەوەی پەیدایان کردبوو لەدارایی‌و منداڵ، وەلە (ئالی عیمران: ١٠)دا دەفەرموێ: (لن تغني عنهم أموالهم ولا أولادهم من الله شيئا)، (ولا ماأتخذوا من دون الله أولياء) وە ئەو خوایانەشیان کردبوونیان بە دۆست لەباتی خوا هیچ شتێکیان لێ دوور ناخەنەوە ﴿ولهم عذاب عظيم﴾ و هێمان سزایەکی زۆر گەورەشیان بۆ هەیە ﴿١١ هذا هدى﴾ ئەم قورئانە مایەی هیدایەت و ڕێنموونییە بۆ هەر کەسێك پەیڕەوی لێبکات ﴿والذين كفروا بآيات ربهم﴾ وئەوانەش

باوەڕیان بە ئایەتەکانی خواوەندیان، واتە، ئایەتەکانی قورئان نیە ﴿لهم عذاب من رجز اليم﴾ سزایەکی دەردناکیان بۆ هەیە لە سەخت ترین جۆرەکانی سزای دەردناك.

**کەویی کردنی دەریاو، ئەویی لە ئاسمان و زەوییدایە بۆ مرۆڤ:**

﴿[١٢] الله الذى سخر لكم البحر﴾ هەر خودا خۆیەتی کەدەریای بۆ ئێوە رامکرد ﴿لتجرى الفلك بأمره﴾ تا بەفەرمانی ئەوکەشتی لەناویا بگەڕێ بێ ئەوەی نقوم ببن ﴿ولتبتغوا من فضله﴾ تا بتوانن لە بەهرەو رۆزی ئەوبخوازن، بە بازرگانی و راوو دەرهێنانی شتی بەنرخ و شتیتر لە کەڵکەکانیتری دەریا ﴿ولعلكم تشكرون﴾ بەشکو سوپاسگوزارو شوکرانە بژێربن لەباتی ئەو بێبڕواییەتان ﴿[١٣] وسخر لكم ما فى السموات وما فى الأرض جميعا منه﴾ هەرچی لەئاسمانەکان و زەویدایە، هەرهەموو خوا بەمیهرەبانی خۆی بۆ ئێوەی رام کردووە ئەستێرە و کێوو دەریاو رووبارو دارو درەخت و..هتد ﴿إن فى ذلك لآيات لقوم يتفكرون﴾ بێگومان لەوانەدا باس کران نیشانەو بەڵگە زۆرن لەسەر دەسەڵاتی خوا بۆخەڵکی بیربکاتەوە لێیان ﴿[١٤] قل للذين آمنوا يغفروا للذين لا يرجون أيام الله﴾ بە بڕواداران بڵێ: چاوپۆشی بکەن لەئەزیەت و ئەشکەنجەی ئەوانەی کە ئومێدی رۆژەکانی خوایان نیە، واتە: بەتەمای هاتنی قیامەت نین، دیارە ئەمە وتەیەکی زۆر ناجوامێرانەی (عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی) بوو کە ئەیوت بەپێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی: (سمن كلبك يأكلك) ئەمە مەسەلێکی عەرەبی یە، واتە: سەگەکەت قەڵەو بکە تا خۆت بخوات!! مەبەستی ئەو ناپاکە لەهاوەڵان بوو، کە گوایا لەمەککەوە هاتوونەتە مەدینەو، ئەمان پەنایان داون کەچی وا ئێستا لێیان هەڵگەڕاونەتەوە. ﴿ليجزي قوما بما كانوا يكسبون﴾ ئێوە ئەیان گەڕێن بۆ خوا تا ئەو خۆی لەرۆژی قیامەتدا بەهەر خەڵکێك بە پێی هەوڵەکانیان پاداش بدا ﴿[١٥] من عمل صالحاً فلنفسه﴾ هەرکەسێك کارێکی چاکی کردبێ ئەوە بۆخۆیەتی کەڵك و پاداشتەکەی (ومن أساء فعليها) هەرکەسێکیش کارێکی خراپی کردبێ، ئەوە تاوانەکەی لەسەر خۆیەتی ﴿ثم إلى ربكم ترجعون﴾ پاشان بۆلای پەروەردگارتان دەگێردرێنەوە.

**منەتی خوا بەسەر جوولەکەوەو، هەڵاواردنیان:**

ئینجا خوای گەورە منەت ئەخاتە سەر جوولەکەکان چونکە ئەم چاکانەی لەگەڵ کردون! وەك ئەفەرمووێ: ﴿[١٦] ولقد آتينا بنى إسرائيل الكتاب والحكمة والنبوة﴾ و سوێند دەخۆم کە:بەڕاستیی ئێم چەندە شتانەمان بە(بەنی ئیسرائیل) بەخشیی:

١- تەورات.

الجزء الخامس والعشرون | سورة الجاثية

قُل لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا يَغْفِرُوا لِلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ أَيَّامَ ٱللَّهِ لِيَجْزِىَ
قَوْمًا بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِنَفْسِهِۦ
وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمْ تُرْجَعُونَ ﴿١٥﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا
بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ
وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦﴾ وَءَاتَيْنَٰهُم بَيِّنَٰتٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ
فَمَا ٱخْتَلَفُوٓا إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْعِلْمُ بَغْيًۢا بَيْنَهُمْ إِنَّ
رَبَّكَ يَقْضِى بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ
﴿١٧﴾ ثُمَّ جَعَلْنَٰكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ فَٱتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ
أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨﴾ إِنَّهُمْ لَن يُغْنُوا عَنكَ مِنَ ٱللَّهِ
شَيْـًٔا وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ وَٱللَّهُ وَلِىُّ ٱلْمُتَّقِينَ
﴿١٩﴾ هَٰذَا بَصَٰٓئِرُ لِلنَّاسِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ
﴿٢٠﴾ أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ ٱجْتَرَحُوا ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن نَّجْعَلَهُمْ كَٱلَّذِينَ
ءَامَنُوا وَعَمِلُوا ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَوَآءً مَّحْيَاهُمْ وَمَمَاتُهُمْ سَآءَ
مَا يَحْكُمُونَ ﴿٢١﴾ وَخَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ
وَلِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٢٢﴾

أفرءيت من | ٥٠٠

. ٢- حوکم و داوەریی.

٣- پەیامبەرایێتیی.

﴿ورزقناهم من الطيبات﴾ وە لە حەلاڵ , رزق و رۆزی پاك و خاوێن و گوزەرانی خۆشمان پێدان ﴿وفضلناهم على العالمين﴾ و رێزیشمان بەسەر گەلانی سەردەمی خۆیاندا دا﴿[١٧] وآتيناهم بينات من الأمر﴾ وسەبارەت بە کاری دینەکەشیان گەلێ بەڵگەی ئاشکراو نمایانمان پێ بەخشین: پەندوئامۆژگاریی، باسی هاتنی پەیامبەر..هتد ﴿فما اختلفوا إلا من بعد ما جاءهم العلم بغيا بينهم﴾ جالەناو خۆیاندا کێشەیان نەبوو لە ئایینەکەیاندا, دوای ئەوە نەبێ بەحەقیقەتی ئایین وئەحکامەکانی, زانینیان بۆ هات, ئەویش لە بەر رکەبەری نێوانیان ﴿إن ربك يقضي بينهم يوم القيامة﴾ بێگومان پەروەردگارت رۆژی قیامەت داوەرییان ئەکات ﴿فيما كانوا فيه يختلفون﴾ لەو کێشمەکێش و مشت و مڕەیان تێیدابوویان.

**وریا بن! بە دووی جوولەکەدا مەچن:**

﴿[١٨] ثم جعلناك على شريعة من الأمر فاتبعها﴾ لەپاش کێشەی خاوەن نامەکان , ئێمە ئەتۆمان خستە سەر بەرنامە و شەریعەتێك لە ئایین,جا تۆیش شوێنی بکەوەو بە پوختی پەیڕەوی بکە ﴿ولا تتبع أهواء الذين لا يعلمون﴾ شوێن هەواو هەوەس و ئارەزووی ئەو نەزانانە مەکەوە ﴿[١٩] إنهم لن يغنوا عنك من الله شيئا﴾ بێگومان ئەوانە هیچ شتێك لە خواوە لە تۆ دوور ناخەنەوە, ئەگەر شوێنیان بکەویت، کەوابوو هیچ کات تاڵە موویەك لەشەریعەتەکەی خوا لا نەدەیت ﴿إن الظالمين بعضهم أولياء بعض﴾ بێگومان ستەمکاران بەشیرك, یارویاوەری یەکترن لەدونیادا ﴿والله ولي المتقين﴾ وپەرستراوی هەقیش (الله) یارو دۆستی پارێزگارانە و سەرپەرشتیی هەموو کارێکیان ئەکات ﴿[٢٠] هذا بصائر للناس وهدى ورحمة لقوم يوقنون﴾ ئەم قورئانە کۆمەڵە بەڵگەیەکە بۆ خەڵك , بۆئەوە ئایینی راستیان پێ ببینن، هەروەك مایەی رێنموونی و میهرەبانیە بۆ گەلێ کە یەقینیان ببێ بەئاخیرەت, دیارە کە ئەوانەش ئیمانداران ,وەك لە سوورەتی(بەقەرە)دا دەفەرموێ:(والذين يؤمنون بما انزل إليك وما أنزل من قبلك وبالآخرة هم يوقنون).

**ژین و مردنی موسڵمان و کافر وەك یەك نین:**

﴿[٢١] أم حسب الذين اجترحوا السيآت﴾ ئاخۆ ئەوانەی بڕوایان نیەو، گوناح و تاوانیش دەکەن، پێیان وایە ﴿أن نجعلهم كالذين آمنوا وعملوا الصالحات﴾ کە وەك ئەوانەیان دادەنێین, بڕوایان هێناوەو کارە چاکەکانیان ئەنجام داوە؟ هەرگیز شتی وا نابێ, وە لەم ئایەتەشدا لەو بارەیەوە ئەفەرمووێ: (لا يستوى أصحاب النار وأصحاب الجنة، أصحاب الجنة هم الفائزون)٥٩/٢٠. ﴿سواء محياهم ومماتهم﴾ پێیان وایە ژیان ومردنیان یەکسانە؟!واتە: پێیان وایە وەك یەك دەژین ودەمرن؟ ﴿ساء ما يحكمون﴾ خراپە ئەو داوەرییە دەیکەن, ئەگەر پێیان وابێت کە هەردوولا یەکسان دەبن ﴿[٢٢] وخلق الله السموات والأرض بالحق﴾ وەخوا ئاسمانەکان و زەوی بە هەق دروستکردووە, کەوابوو دادگەریش لەوەدا نیە، کە موسڵمان و خراپکار وەك ی چیکردووە ەك بن ﴿ولتجزى كل نفس بما كسبت﴾ وە تاهەموو کەسێك بەپێی ئەوەجەزای بدرێتەوە کردوویەتی ﴿وهم لا يظلمون﴾ وە لە هەمان کاتیشدا ستەمیان لێناکرێ.

**مرۆڤی ئارەزوو پەرەست دەبێتە موشریك:**

﴿[٢٣] افرایت من اتخذ إلهە هواه﴾ ئایا تۆ ئەو کەسەت دیتووە کە هەواو ئارەزووی خۆی دەکردە خواو
دەیپەرست؟! واتە: هەرکەسێ - لە باتی پەیڕەوی لە ئایینی خوای بەهەق - شوێنی هەواو هەوەسی خۆی بکەوێ،
کافرو بێ باوەڕە ﴿واضله الله علی علم﴾ وەخوا - لە سەر زانینێك کەبەرامبەر ئەو کەسە بوویەتی، پێش ئەوە
دروستی بکات- گومڕایکردووە ﴿وختم علی سمعه وقلبه﴾ وە مۆریشی بەسەر گوێ و دڵیدا ناوە، هیچ خێرو
بێرێکیان تێناچێت ﴿و جعل علی بصره غشاوة﴾ و پەردەیەکیشی بەسـەر چاویدا هێناوە ﴿فمن یهدیه من
بعدالله﴾ جا کێ هەیە پاش خوا رێنمایی رێـی راستیی بکات، ئەگەر ئەو خۆی نـەیکا؟ ﴿افلا تذکرون﴾ دە ئایا
ئامۆژگاری ناگرن؟ ﴿[٢٤] وقالوا ماهی إلا حیاتناالدنیانموت
ونحیا﴾ هاوبەشدانەرەکان وتیان: جگە لـەم ژیـانی
دونیایەمان ، شتێکی تر لە گۆڕدا نیە، بۆ خۆمان ئەژین و
ئەمرین، واتە: دەستەیەك ئەژیی و دەستەیەك ئـەمرێ، ئیتر
دوای ئەوە نەزیندوو بوونەوە هەیە، نە لێپرسینەوە!! ﴿وما
یهلکنا إلا الدهر﴾ وە هەر سروشت و زەمان و رۆژگارە
دەمانمرێنی و لەناومان دەبات. لەوە ئەچێ ئەوانە هەندێك
بوو بن، بڕوایان وابوو بێ کە هەمووشتێك هەر بەدەستی
سروشت و رۆژگارە، لەوانەن کە پێیان وتوون (دەهریی)،
ئێستایش پاشماوەیان لەهۆنراوەو پەخشانی شاعیرەکاندا
ئەبینرێ: (وەك ئەم وشانە: فەلەك! زەمانە! غەددار! چەرخی
چەپگەڕ!..هتد)، جا ئەوانە لە هەموو سات و سەردەمێکدا
سەریان هەڵداوەو سەر هەڵئەدەن و، هەوڵی چەسپاندنی ئەو
بیرۆکەیە ئەدەن، بەو هیوایەوە خەڵکی لە شەرعی خوا دوور
بخەنەوە، گومانیش نییە لەوەدا کە بەخەستیی خۆیشیان
سەرگەردانن، جگە لـە شوێنکەوتووەکانیشیان.. ئـەوە
کۆمـەڵی سـادەو سـاویلکەیە". ئیمـامی (موسـلیم) ئـەم



فەرموودەیەی هێناوە: ((لا تسبوا الدهر، فإن الله هو الدهر)). پێشەوا شافیعیی ئەڵێ: عەرەبەکان لەسەردەمی
جاهیلیەتدا کە بەڵاو نەهامەتێکیان تووش دەبوو ئەیان وت: (یاخیبة الدهر!)، ئەو ڕووداوانەیان دەدایە پاڵ ساڵ و
زەمان وجنێویان ئەدا، خۆ لە واقیع و بنەڕەتیشدا هەر خوای گەورەیە ئەو کارانە ئەکا، جا کەوابوو وەك جنێویان
بەخوا دابێ وایە، چونکە لەهەقیقەتدا خوا خۆیەتی زەمانە دەگێڕێ و (فاعیل)ـە، (ئیبن کەسیر). (وما لهم بذلك من
علم) ئەوانەش ئەو قسە ئەکەن، هیچ جۆرە زانستێکیان لەو بارەوە نیە، هەر لە خۆیانەوە ئەو قسەیە دەکەن ،واتە:
ئەوەی دەیڵێن لە ڕێی زانستەوەنیە ﴿إن هم إلا یظنون﴾ بەڵکو تەنها گومان ئەبەن، گومان بەو لاوە هیچ دڵنیاییەکیان
نییە ﴿[٢٥] وإذا تتلی علیهم آیاتنا بینات﴾ هەرکات ئایەتە ڕوونەکانی ئێمەیان بە سەرا بخوێنرێتەوە کە بەڵگەن بۆ
زیندوو بوونەوە ﴿ماکان حجتهم إلا ان قالوا ائتوا بآبائنا إن کنتم صادقین﴾ هیچ بەڵگەیەکیان نەبووە، ئەوە نەبێ

ئەڵێن: ئەگەر راست ئەکەن زیندووبوونەوە هەیە دەساباوو باپیرانمان بۆ زیندوو بکەنەوەو بۆمان بێنن ﴿[٢٦] قل الله
یحییکم ثم یمیتکم﴾ بڵێ: هەر خوا دەتانژێنێ ,پاشان دەتانمرێنێ ﴿ثم یجمعکم إلی یوم القیامة لا ریب فیه﴾ پاش
زیندووبوونەوە هەمووتان کۆئەکاتەوە بۆرۆژی هەستانەوە, کە بۆ هاتنیهیچ گومانێك نیە ﴿ولکن اکثر الناس لا
یعلمون﴾ بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن ﴿[٢٧] ولله ملك السموات والأرض﴾ هەر بۆ خوایە دەسەڵاتی ئاسمانەکان و
زەویی ﴿ویوم تقوم الساعة یومئذ یخسر المبطلون﴾ وەئەو رۆژە کە قیامەت بەرپا دەبێ; هەموو ناهەقکاران
زیانمەندو رەنجەڕۆ ئەبن ﴿[٢٨] وتری کل امة جاثیة﴾ هەموو ئوممەتێکیش ئەبینی: لەترسا بەسەر چۆکدا کەوتوون ,
بێ دەسەڵات و ملکەچ ﴿کل امة تدعی إلی کتابها﴾ هەموو ئوممەتێکیش بۆوەرگرتنی نامەی کردەوەکانی خۆی بانگ
دەکرێ ﴿الیوم تجزون ماکنتم تعملون﴾ پێیان ئەوترێ: ئەوا ئەمڕۆ, لەڕاست هەر کارێ کردوتانە, پاداش ئەدرێنەوە.
**کردەوەکانتان گشت فتوکۆپی دەکەین:**

﴿[٢٩] هذا کتابنا ینطق علیکم بالحق﴾ پێیان ئەوترێ:ئەمە کتێبی ئێمەیەو فریشتەکان تۆماریان کردووە,
بەدادگەرانە شایەتیتان لەسەر ئەدات ﴿إنا کنا نستنسخ ما کنتم تعملون﴾ بێگومان ئێوەهەشتێکتان دەکرد, ئێمە
ئەمان نووسیی, واتە: فریشتەکان بە فەرمانی خۆمان , نوسخەیان لەبەر ئەگرتەوە ﴿[٣٠] فأما الذین آمنوا وعملوا
الصالحات﴾ ئینجا ئەوانەی کە بڕوایان هێناو کارە چاکەکانیان ئەنجامدا ﴿فیدخلهم ربهم في رحمته﴾ پەروەردگاریان
ئەیانباتە ناو بەزەیی (بەهەشتی)خۆیەوە, جاخوا بەبەهەشت ئەفەرموێ: ((انت رحمتی، ارحم بك من اشاء)) متفق
علیه. ﴿ذلك هو الفوز المبین﴾ ئائەوەیە سەرکەوتنی گەورە ﴿[٣١] واما الذین کفروا﴾ خۆ بەوانە بێ باوەڕن ﴿افلم
تکن آیاتي تتلی علیکم﴾ ئەوترێ:ئایائایەتەکانم بەسەرتاندا نەخوێنرایەوە, تا ئاوا نەکەن بە خۆتان؟ ﴿فاستکبرتم﴾
جاخۆتان بەزلزانیو دەمارگیریی نەیهێشت بڕوا بێنن؟ ﴿وکنتم قوما مجرمین﴾ دیارەئێوەگەلێکی تاوانکاربوون
﴿[٣٢] وإذا قیل إن وعدالله حق﴾ وەکاتێ بگوتراباکە بەڵێنی خوا –بە جەزای قیامەت– هەق و راستە ﴿والساعة
لاریب فیها﴾ و قیامەتیش هیچ گومانی تێدا نیە ﴿قلتم ما ندری ما الساعة﴾ ئەتانوت: نازانین قیامەت چیە؟ ﴿إن
نظن إلا ظنا﴾ دڵنیانین بە هاتنی، ئێمە تەنها گومانێکمان هەیە بۆ هاتنی,ئەویش بەدەم ئەم و ئەوەوە ئەبیستین
ئەڵێن قیامەتێك دێت ﴿وما نحن بمستیقنین﴾ وە ئێمە یەقیندار نەبووین بە هاتنەکەی ﴿[٣٣] وبدالهم سیئات ما
عملوا﴾ وەزشتیەکانی کارەکانیان بۆدەرکەوت ﴿وحاق بهم ماکانوا به یستهزئون﴾ وئەوسزایەش لاقرتیان پێ
ئەکرد, دەوریدان ﴿[٣٤] وقیل الیوم ننساکم﴾ پێیان وترا: وا ئەمڕۆ ئێمە, ئێوە فەرامۆش ئەکەین ﴿کما نسیتم لقاء
یومکم هذا﴾هەرچۆنێ ئێوە دیداری ئەمڕۆی ئێمەتان لەبیرکرد, ئێوەپێتان وابوو هەرگیز بەم رۆژە ناگەن!.
لەفەرمودەیەکی ڕەوادا – موسلیم) هێناویەتی– هاتووەکە: خوا لە ڕۆژی قیامەتا بەهەندێ لە بەندەکانی دەڵێ: ئایا
جووتم نەکردییت لەگەڵ هاوسەری خۆت؟ ئایا ڕێزم نەگرتیی؟ ئایا ئەسپ و وشترو ماینم بۆ رام نەکردییت؟ ئایا
وازم لێ نەهێنایت ببیتە سەرۆك و ئیسراحەت بکەیت..؟ئەویش دەڵێ: بەڵێ ئەی پەروەردگارم! ئەفەرموێ: ئایا نەت
دەزانی ڕۆژێك دێیتە دیدارم؟ دەڵێ: نەخێر، جا خوا ئەفەرموێ: کەوابوو منیش ئەمڕۆ ئێوە لەبیر ئەکەم، هەر وەکو
تۆ منت لەبیر کرد. ﴿ومأواکم النار﴾ وەجێشتان ئاگری دۆزەخە ﴿ومالکم من ناصرین﴾ وە هیچ کەسیش یارو
یاوەرتان نابێت تا لەو سزایە ڕزگارتان بکات ﴿[٣٥] ذلکم بأنکم اتخذتم آیات الله هزوا﴾ ئەوەشتان بەو هۆیەوەیە
کەئێوە ئایەتەکانی خواتان کردبوون بە گاڵتەو گەپ! ﴿وغرتکم الحیاة الدنیا﴾ و ژیانی دونیاش چەواشەی
کردبوون﴿فالیوم لا یخرجون منها﴾ جائەمڕۆکە بەهیچ شێوەیەك لە دۆزەخ دەرناهێنرێن ﴿ولاهم یستعتبون﴾

وەداوای رازیکردنی خوایشیان لێناکرێت بەبیانوو هێنانەوە ﴿[٣٦] فلله الحمد رب السموات ورب الأرض﴾ جا سوپاس هەر بۆ خوای پەروەردگاری ئاسمانەکان و پەروەردگاری زەوی ﴿رب العالمین﴾ و پەروەردگاری هەمووجیهانەکان ﴿[٣٧] وله الکبریاء فی السموات والأرض﴾ وگەورەیی لەئاسمانەکان و زەویدا هەر بۆ ئەوە، بۆیە لەم فەرمووده قودسیەدا دەفەرموێ: ((العظمة إزاری، والکبریاء ردائی، فمن نازعنی واحداً منهما أسکنته ناری)) موسلیم. ﴿وهو العزیز الحکیم﴾ هەر ئەویشه دەسەڵاتداری جوانکار.

له ٨/ی (رەجەب)ی (١٤١٧)ك، بەرامبەر به ١٩٩٦/١١/١٩ز، لەنووسینی تەفسیری سورەتی (جاثیة) بوومەوە، له شاری (مەریوان)ی کۆماری ئیسلامیی (ئێران). سوپاس و ستایشیش بۆ خوای تاك و تەنیا، خاوەنی هەموو بوونەوەر.

کۆتایی جزمی بیست و پێنجەم
و لله الحمد والمنة.

*** *** ***




## ٤٦- سوورەتی (ئه حقاف) لـه مەککەییەو (٣٥) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

مەبەستی ئەم سوورەتەش، هەرلە مەبەستی سورەتە مەککەییەکانی تر دەکات، لە سەرەتاوە باس لەگرنگی قورئان ئەکات، ئینجا باس لەو بتپەرستانە دەکات، پێیان وایە بتەکانیان لەدوا رۆژدا تکایان بۆ ئەکەن! پاشان هەندێ لە رەخنەکانیان لە قورئان دێنێ، دواتر باسی دوو دەستە لە مرۆڤەکان ئەکات، دەستەیەکیان لەسەر رێی هیدایەتن، ئەوی تریان گومرا و سەرلێشێواون، باسێکی (هوود) ﷺ ئەکات، کۆتاییشی دێت بەوەکە: جنیەکان چەند کەسێکیان گوێیان لە قورئان گرت و، سەرەنجام بروایان هێنا، جا کە گەڕانەوە بۆ لای قەوم و هۆزەکەی خۆیان بانگیانکردن بۆ باوەڕو ئیمان.

### قورئان لەخواوەیەو، بونەوەریش ئەو بەدیهێناوە:

﴿بسم الله الرحمن الرحیم * [١] حم﴾ مەبەست بەم جۆرە پیتانە دەستەو سانکردنی عەرەبەکانە، لە بەرامبەر قورئاندا، پێیان ئەڵێ: ئەگەر ئێوە گومانێکتان لەم قورئانە هەیە کە لەلایەن خواوە بێت، دەسا فەرموون لەم جۆرە پیتانە ئێوەیش وێنەی ئەو بێنن؟! ﴿[٢] تنزیل الکتاب من الله العزیز الحکیم﴾ ئەم قورئانە لەلایەن خوایەکی بەتوانای کار جوانەوە دابەزێنراوەتە خوارەوە ﴿[٣] ما خلقنا السموات والأرض وما بینهما إلا بالحق وأجل مسمی﴾، ئاسمانەکان و زەویی و ئەوەی نێوانیان، بە دادگەری و بەتەقدیری ماوەیەکی دیاریکراو نەبێ، دروستمان نە کردوون، ئیتر پاش ئەو مەودایە دواییان دێ و، ئێوەیش دێنەوە بەردەست خۆم ﴿والذین کفروا عما أنذروا

معرضون﴾ ئەوانەی بڕوایان نەهێناوە ڕوو وەر ئەگێڕن لەوەی پێی ترسێنراون لە دروستکردنەوەیەکی نوێ بۆ جەزا! ﴿٤ قل ارایتم ماتدعون من دون الله﴾ ئەی محەممەد! ﷺ پێیان بڵێ: هەواڵی ئەو پەرستراوانەم بدەنێ کە: ئێوە لەباتی خوا ئەیانپەرستن و هاواریان بۆ دەبەن؟ ﴿ارونی ماذا خلقوا من الأرض﴾ ئەوانە لەم زەویەدا چییان دروستکردووە, نیشانمی بدەن؟ ﴿ام لهم شرك فی السموات﴾ یان لە دروست کردنی ئاسمانەکاندا بەشدارێکیان هەیە؟! ﴿ائتونی بکتاب من قبل هذا أو اثارة من علم﴾ وە ئەگەر هاوبەشییان هەیە، دە کەواتە نامەیەکی ئاسمانیم نیشانبدەن کە لەپێش هاتنی ئەم قورئانەدا بۆتان هاتبێت، وە یان شوێنەوارێکی زانستیی لە ڕابوردووانەوە کە بەڵگە بێت لەسەر قسەکەتان، ئادەی یەکێ لەمانەم بۆ بێنن ﴿إن کنتم صادقین﴾ ئەگەر ئێوە ڕاست ئەکەن ئەوانە هاوبەشی خوان ﴿٥ ومن اضل ممن یدعو من دون الله من لا یستجیب له إلی یوم القیامة﴾ کێ لەوکەسە گومڕاترە -جگە لە خوا- شتێ بپەرستێ , کە تا ڕۆژی قیامەت بە دەنگیەوە نایەو و وەڵامی دوعاو پاڕانەوەی ناداتەوە ﴿وهم عن دعائهم غافلون﴾ ئەوانە لەپەرستن و هاوارەکەش بێ ئاگاو غافڵن, چونکە دارو بەرد وەڵامیان لە کوێ بوو؟، دیارە لەو سەردەمەدا هەندێ کەس دارو درەختی ئەپەرستن! هەندێکی تر فریشتە! هەندێکی دی شەیتان.. هتد!, بۆیە ئاوا سەر زەنشتیان دەکا. ﴿٦ وإذا حشر الناس کانوا لهم أعداء﴾ وە کاتێ خەڵکی کۆکرانەوە بۆ حیساب بتەکان دەبن بە دوژمن بۆبتپەرستەکان. ﴿وکانوا بعبادتهم کافرین﴾ بێ لەوەش حاشا لە بتپەرستنەکەیان دەکەن, وە لە فەرمایشتیی: (واتخذوا من دون الله آلهة لیکونوا لهم عزا کلا سیکفرون بعبادتهم ویکونون علیهم ضدا) (١٩/٨١-٨٢). تەئکید لەسەر هەمان ماناو مەبەست دەکات.

**ڕەخنەی موشریکان دەربارەی قورئان و پێغەمبەر و وەڵامیان:**

﴿٧ وإذا تتلی علیهم آیاتنا بینات﴾ وە کاتێ ئایەتە ڕوون و ئاشکراکانی ئێمەیان بەسەرا بخوێنرێتەوە "لە لایەن تۆوە ئەی موحەممەد ﷺ ﴿قال الذین کفروا للحق لما جاءهم﴾ ئەوسا ئەوانەی کە خوانەناس و بێ بڕوان بەو بەرنامە ڕاست و دروستە کە بۆیان هاتووە ئەڵێن:" ﴿هذا سحر مبین﴾ ئەمە جادوویەکیڕوون و ئاشکرایە "بەلای هەموو کەسێکەوە" ﴿٨ أم یقولون افتراه﴾ یان ئەڵێن: محمد خۆی ئەو قورئانەی هەڵبەستووە!! "ئەوەندە سادەو گێلە پیاون" ﴿قل إن افتریته فلا تملکون لی من الله شیئا﴾ پێیان بڵێ: ئەگەر خۆم ئەو قورئانەم هەڵبەستبێ، ئەوە بە زوویی خوا سزام دەدا, وەئێوەش لەبەرانبەر دەسەڵاتی خواوە ناتوانن هیچ شتێك بۆ من بکەن, وەك لەسوورەتی تردا ئەفەرمووێ: ﴿قل إنی لن یجیرنی من الله احد ولن اجد من دونه ملتحدا، إلا بلاغا من الله ورسالاته..﴾ (٧٢/٢٢-٢٣)، وە هەروا دەفەرمووێ: ﴿ولو تقول علینا بعض الأقاویل لأخذنا منه بالیمین، ثم لقطعنا منه الوتین، فما منکم من احد عنه حاجزین﴾، (٦٩/٤٤-٤٦). ﴿وهو أعلم بما تفیضون

الجزء السادس والعشرون | سورة الأحقاف

وَإِذَا حُشِرَ ٱلنَّاسُ كَانُواْ لَهُمْ أَعْدَآءً وَكَانُواْ بِعِبَادَتِهِمْ كَٰفِرِينَ ﴿٦﴾ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٧﴾ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ قُلْ إِنِ ٱفْتَرَيْتُهُۥ فَلَا تَمْلِكُونَ لِى مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا هُوَ أَعْلَمُ بِمَا تُفِيضُونَ فِيهِ كَفَىٰ بِهِۦ شَهِيدًۢا بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٨﴾ قُلْ مَا كُنتُ بِدْعًا مِّنَ ٱلرُّسُلِ وَمَآ أَدْرِى مَا يُفْعَلُ بِى وَلَا بِكُمْ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ وَمَآ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٩﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَكَفَرْتُم بِهِۦ وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ مِثْلِهِۦ فَـَٔامَنَ وَٱسْتَكْبَرْتُمْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَوْ كَانَ خَيْرًا مَّا سَبَقُونَآ إِلَيْهِ وَإِذْ لَمْ يَهْتَدُواْ بِهِۦ فَسَيَقُولُونَ هَٰذَآ إِفْكٌ قَدِيمٌ ﴿١١﴾ وَمِن قَبْلِهِۦ كِتَٰبُ مُوسَىٰٓ إِمَامًا وَرَحْمَةً وَهَٰذَا كِتَٰبٌ مُّصَدِّقٌ لِّسَانًا عَرَبِيًّا لِّيُنذِرَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ وَبُشْرَىٰ لِلْمُحْسِنِينَ ﴿١٢﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُواْ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿١٣﴾ أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ خَٰلِدِينَ فِيهَا جَزَآءًۢ بِمَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿١٤﴾

٥٠٣

﴿فيه﴾ خوا خۆی زاناتره سه‌بارەت بەو قورئانە کە ئێوە ڕۆ ئەچن تێیدا: جاری ئەڵێن: جادووە، جاریٚ دەڵێن شیعرو هۆنراوەیە.. هتد! ﴿كفى به شهيدا بيني وبينكم﴾ من هەر خوام بەسە کە شایەد بێت لەنێوان من و ئێوەدا "بۆ گەواهیی لەسەر ڕاستیی من و، ناڕاستیی ئێوە. ﴿وهو الغفور الرحيم﴾ وە ئەویشە لێبوردەی میهرەبان بۆ ئەوانەی تەوبە بکەن ﴿[٩] قل ماكنت بدعا من الرسل﴾ پێیان بڵێ: کە من یەکەم کەس نیم، لە پێغەمبەرەکاندا تا ئینکاری پەیامەکەم بکەن. نەخێر، بەڵکو پێش من چەندان پەیامبەری تر هاتووە، کە ئەوانیش هەر ئەوەی منیان وتووە ﴿وما ادري ما يفعل بي ولا بكم﴾ و نایشزانم چی بەسەر من وچی بەسەر ئێوەدا دەهێنرێ؟ چونکە گشت بڕیارەکانی خوا لە منەوە ناردیارن. عەلی کوڕی ئەبی تەڵحە لە ئیبن عەباسەوە –خوا لێیان ڕازی بێ– دەڵێت: پاش ئەو ئایەتەی: (وما ادري ما يفعل بي ولا بكم) ئایەتی: (ليغفر لك الله ماتقدم من ذنبك وما تأخر..). هات بۆ وەڵامی ئەو(وما ادري..)وە، بۆ وەڵامی موسڵمانەکانیش ئایەتی: (ليدخل المؤمنين والمؤمنات جنات تجري من تحتها الأنهار) هات. تەفسیری تەبەریی: ٩٩/٢٢. ﴿إن اتبع إلا ما يوحى إلي﴾ من پەیڕەوی هەرلە وەحی دەکەم، کە لەلایەن خواوە بۆم دێت ﴿إن انا إلا نذير مبين﴾ من هەر بێدارکەرەوەو ترسێنەرێکی ئاشکرام، لەوە بەولاوە هیچی ترم بەدەست نیە، جا کەوابوو من خەریکی کاری خۆمم و، ئێوەیش خەریکی کاری خۆتان بن ﴿[١٠] قل ارايتم إن كان من عندالله وكفرتم به﴾ پێیان بڵێ: باشە چ دەبینن و حاڵتان چۆن دەبێت ئەگەر، ڕۆشن بوویەوە ئەم قورئانە لەلایەن خواوە بێت و، ئێوەیش هەر بڕوای پێ نەکەن؟! ﴿وشهد شاهد من بني إسرائيل على مثله فآمن واستكبرتم﴾ وە شایەتێك زانایەکی پلە بەرز– عەبدوڵڵای کوڕی سەلام– لەنەوەی یەعقوب گەواهیی لەسەر وێنەی واتای قورئان دا ئنجا بڕوای بە (محمد و بەقورئان) هێنا، وە ئێوەش هەرخۆتان بە گەورە زانی لە بڕواهێنان، ئایا ئێوە ستەمکار نین؟! ﴿إن الله لايهدي القوم الظالمين﴾ بەڕاستیی خوا هیدایەت و ڕێنوێنی قەومی ستەمکار واتە: کافر ناکات، چونکە بەئارەزووی خۆیان ئەورێگەیانە هەڵبژاردووە.

**قورئان کەلامی راست و ڕەوای خوایە:**

﴿[١١] وقال الذين كفروا للذين آمنوا﴾ وە بێ باوڕەکان سەبارەت بەوانەی ئیمان و بڕوایان بە قورئان هێنابوو وتیان: ﴿لو كان خيرا ما سبقونا إليه﴾ ئەگەر ئەوەی موحەممەدپێی هاتووە، واتە: قورئان شتێکی چاك بووایە ئەوهەژارانە (سوهەیب و عەممارو بیلال) پێشمان نەدەکەوتن لە ئیمان هێنان پێی!! چونکە ئێمەین خاوەن ڕێز لای خوا ﴿وإذ لم يهتدوا به﴾ وە وەختێ پەیان پێ نەبرد، واتە: پەیان بە قورئان نەبرد ﴿فسيقولون هذا إفك قديم﴾ جا دەیانوت: ئەمە ئەفسانەو درۆیەکی هەڵبەستراوی کۆنە لەپێشینانەوە ماوەتەوە بۆیان!! بۆیە ئێمە بڕوای پێ ناکەین! ئەمە لە گەورەترین جۆری نکووڵی هەق و، خۆ بەزل زانین و خەڵك بەکەم زانینە، کە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ئەفەرمووێ: (بطر الحق وغمط الناس)(متفق عليه)مسلم: ٩٣/١. واتە: کیبرو خۆ بەزل زانین بریتیە لە نکوڵی هەق و خەڵك بەکەمزانین ﴿[١٢] ومن قبله كتاب موسى إماما ورحمة﴾ لە پێش ئەم قورئانەیشەوە خوا نامەکەی موسای دابەزاندو کردی بە پێشەواو بەزەیی بۆ بەنی ئیسرائیل. خۆ لەمەدا هیچ مشت ومڕتان نییە، دەی هەر لەو نامەیەدا موژدەی هاتنی پێغەمبەر ﷺ ئەدات ﴿وهذا كتاب مصدق لساناً عربيا﴾ ئەم قورئانەش نامەو کتێبەکە سەلمێنەری تەورات و کتێبە پێشووەکانی خۆیەتی بەزمانێکی پاراوی عەرەبی هاتووە ﴿لينذر الذين ظلموا﴾ تا ستەمکارەکان بترسێنێ بە سزای دۆزەخ ﴿وبشرى للمحسنين﴾ و بەچاکە کارانیش موژدە بەخش بێت بەبەهەشت کەوابوو کتێبێکی ئاوا چۆن دەگونجێ درۆ و ئەفسانەیپێشووان بێ؟! ﴿[١٣] إن الذين قالوا ربنا الله ثم استقاموا﴾ بەڕاستیی

ئەو کەسانەی کە دەڵێن: پەروەردگارمان (الله)یەو، پاشان پابەندی ئەو ئیمانە دەبن و ڕێك و پێك لەسەر ڕێگای ڕاست، دەوەستن و هەرگیز بەڕاست و چەپدا لا نادەن ﴿فلا خوف عليهم ولاهم يحزنون﴾ ئەوانە هیچ بیم و ترسێکیان لەسەر نابێت "لەپاشە ڕۆژدا" و خەفەتبارو دڵ زویریش نابن، بۆ دونیایان و بۆی پەشیمان نابن ﴿[14] اولئك اصحاب الجنة خالدين فيهاجزاء بما كانوا يعملون﴾ ئەوانە بەوەصیفەتانە, یارانی بەهەشتن, بەهەتاهەتایی تێیدان, لە پاداشتی ئەو کارو کردەوانەدا کردوویانە.

**سپاردەی خوا لەمەڕ باب و دایکەوە:**

ئیتر پاش فەرمان بەیەکتاپەرستیی و ئیخلاص بۆ خوا, فەرمووی: ﴿[15] ووصينا الإنسان بوالديه إحسانا﴾ فەرمانمان بە ئادەمزاد دا بەچاکەکردن لە گەڵ دایك وباوکی ﴿حملته امه كرها ووضعته كرها﴾ دایکی بە ئەو پەڕی سەختییو ناڕەحەتیو ئازارەوە بە پێستی سك هەڵیگرت و (دووگیان بوو), و زۆر بەدژواریش داینا، ئیتر چۆن گوێ ڕایەڵیی نەکرێت؟ ﴿وحمله وفصاله ثلاثون شهراً﴾ وەماوەی دووگیانیو، لە شیر بڕینەوەی (٣٠) مانگی خایاند, واتە: بەهەمووی دوو ساڵ و نیوی خایاند، ئەم ئایەتەو ئایەتی ﴿وفصاله فى عامين﴾ (١٤/٣١) هەردووکیان ئەندازەی لای خارووی مانەوەی منداڵ لە سکی دایکیدا دیاریی ئەکەن بە شەش مانگ، وە ماوەی شیر خواردنیش دیاری دەکات بە دوو ساڵ ﴿حتى إذا بلغ اشده﴾ تا ئەو ئادەمیزادە کاتێ گەیشت بەکەماڵی هێزو ژیری خۆی ﴿وبلغ اربعين سنة﴾ وگەیشت بە تەمەنی چل ساڵیی، دیارە ئیتر کاتی ئەوەیە کە بەچاکی ڕوو بکاتەوە خوای خۆی، بۆیە ﴿قال رب اوزعنى ان اشكر نعمتك التى انعمت على وعلى والدى﴾ وتی: ئەی پەروەردگارم!! ڕامهێنەو کۆمەکیم بکە کە سوپاسی ئەو نازو نیعمەت و بەهرەیەت بکەم کە بە من و باوك و دایکمت داوە,

الجزء السادس والعشرون | سورة الأحقاف

وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ إِحْسَٰنًا ۖ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ كُرْهًا وَوَضَعَتْهُ
كُرْهًا ۖ وَحَمْلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ ثَلَٰثُونَ شَهْرًا ۚ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَبَلَغَ
أَرْبَعِينَ سَنَةً قَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِىٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتَ
عَلَىَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَىَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَٰلِحًا تَرْضَىٰهُ وَأَصْلِحْ لِى فِى
ذُرِّيَّتِىٓ ۖ إِنِّى تُبْتُ إِلَيْكَ وَإِنِّى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿١٥﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ
نَتَقَبَّلُ عَنْهُمْ أَحْسَنَ مَا عَمِلُوا۟ وَنَتَجَاوَزُ عَن سَيِّـَٔاتِهِمْ فِىٓ أَصْحَٰبِ
ٱلْجَنَّةِ ۖ وَعْدَ ٱلصِّدْقِ ٱلَّذِى كَانُوا۟ يُوعَدُونَ ﴿١٦﴾ وَٱلَّذِى قَالَ
لِوَٰلِدَيْهِ أُفٍّ لَّكُمَآ أَتَعِدَانِنِىٓ أَنْ أُخْرَجَ وَقَدْ خَلَتِ ٱلْقُرُونُ مِن
قَبْلِى وَهُمَا يَسْتَغِيثَانِ ٱللَّهَ وَيْلَكَ ءَامِنْ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ فَيَقُولُ
مَا هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٧﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ حَقَّ عَلَيْهِمُ
ٱلْقَوْلُ فِىٓ أُمَمٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِم مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ ۖ إِنَّهُمْ كَانُوا۟
خَٰسِرِينَ ﴿١٨﴾ وَلِكُلٍّ دَرَجَٰتٌ مِّمَّا عَمِلُوا۟ ۖ وَلِيُوَفِّيَهُمْ أَعْمَٰلَهُمْ وَهُمْ
لَا يُظْلَمُونَ ﴿١٩﴾ وَيَوْمَ يُعْرَضُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ عَلَى ٱلنَّارِ أَذْهَبْتُمْ طَيِّبَٰتِكُمْ
فِى حَيَاتِكُمُ ٱلدُّنْيَا وَٱسْتَمْتَعْتُم بِهَا فَٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ ٱلْهُونِ
بِمَا كُنتُمْ تَسْتَكْبِرُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَبِمَا كُنتُمْ تَفْسُقُونَ ﴿٢٠﴾

٥٠٤ | وَٱذْكُرْ أَخَا

ڕاسپاردنی مرۆڤ بە چاکە کردن لەگەڵ باوك و دایکا لە گەڵێ جێگەدا هاتووە، وەك: (وقضى ربك ألا تعبدوا إلا إياه وبالوالدين إحسانا) (٢٣/١٧) وە وەك (أن اشكر لى ولوالديك إلى المصير) (١٤/٣١). ﴿وان اعمل صالحا ترضاه﴾ وەکە کردەوەیەکی چاکی وا ئەنجام بدەم تۆ لێی ڕازی بیت ﴿واصلح لى فى ذريتى﴾ وە نەوەو منداڵەکانیشم بۆ صاڵح و چاك بکە. ﴿إنى تبت إليك وإنى من المسلمين﴾ بێگومان من لە رابردووم پەشیمانم و بۆلای تۆ دەگەڕێمەوە، وە بەڕاستی من لە موسڵمانانی فەرمانبەردارم, دەتۆیش لێم خۆش ببە.تێبینی: لە سیاقی ئەم ئایەتەوە وا دەردەکەوێ کە مەبەست بە (الإنسان) لە فەرمایشتی:(ووصينا الإنسان..)دا, کەسێك بووە لە سەر دەمێکدا ژیاوە,وە فەرموودەی:(وحمله و فصاله ثلاثون شهرا..) دەلالەت لەسەر ئەوە دەکات.

ئینجا خوایش بە باشترین شێوە پاداشتی ئەداتەوە، وەك ئەفەرموێ ﴿[١٦] اولئك الذین نتقبل عنهم احسن ما عملوا﴾ ئا ئەوانە کەسانێکن کە ئێمەش کارە چاکەکانیان لێ وەردەگرین و پاداشتیان ئەدەینەوە ﴿ونتجاوز عن سیئاتهم في اصحاب الجنة﴾ و لەگوناهو تاوانیشیان ئەبوورین، وە لەڕیزی بەهەشتییەکاندا دەبن ﴿وعد الصدق الذی کانوا یوعدون﴾ ئەمەش ئەو بەڵێنە ڕاستە بوو، کە هەمیشە لەسەر زمانی پەیامبەرەکان پێیان ئەدرا، بەڵێ..
ئەومرۆڤە نموونەی مرۆڤی راساڵ و چاککاربوو لە گەڵ دایك وباوکیدا.

**منداڵی لاسار لەگەڵ باب و دایکیدا:**

﴿[١٧] والذی قال لوالدیه اف لکما﴾ وە ئەوەیش بە باوك و دایکی خۆی گوت: هاوار و ئۆف لەدەست ئێوە ﴿اتعداننی ان اخرج وقد خلت القرون من قبلی﴾ ئایائێوە بەڵێن بەمن ئەدەن کە جارێ تر دەر بهێنرێمەوە لە گۆڕو زیندوو بکرێمەوە، وەئەوە ساڵەهای ساڵە کە خەڵکێکی زۆر لە پێش منەوە ڕۆیشتوون و مردوون و هیچ کەسێکیان لێ زیندوو نەبۆتەوە ﴿وهما یستغیثان الله ویلك آمن﴾ وە دایك و باوکیشی پەنایان بەخوا دەبرد کە ڕێنموونی کوڕە کافرولاسارەکەیان بکا و دەیانگوت: تیاچووی خۆت باوەڕ بهێنە، بە پاشە ڕۆژو زیندووبوونەوە ﴿إن وعد الله حق﴾ بەڕاستیی بەڵێنی خوا بە زیندوو بوونەوە هەق و ڕاستە ﴿فیقول ماهذا إلا اساطیر الأولین﴾ کەچی بێلێکدانەوە ئەویش دەیگوت: ئەم قسانە چییە، زیندووبوونەوەی چی؟ ئەمە هەرئەفسانەو پڕوپاڵانتەی پێشینانەو شتێ تر نییە،ئەم مرۆڤەش نموونەی مرۆڤی کافرو لاسار بوو لە گەڵ دایك وباوکی.﴿[١٨] اولئك الذین حق علیهم القول﴾ ئائەوانەش کەسانێکن کە فەرمایشتی خوا بە سزا بەسەریانداچەسپاوە ﴿فی امم قد خلق من قبلهم من الجن والإنس﴾ هەربەدەردی ئوممەت و گەلانی پێشین لە جنۆکەو مرۆ لەسەریان کەوت و هاتە دی، واتە: خەڵکێکی زۆریش لە پێشیانەوە سەرپێچییان کردو سزای خوایان بەسەردا درا، جا ئەمیش وەك ئەوان گیرۆدەبوو ﴿إنهم کانوا خاسرین﴾ بەڕاستیی ئەوانە هەرهەموویان زیانمەند بوون ﴿[١٩] ولکل درجات مما عملوا﴾ وەبۆ هەریەك لە بڕوادارو بێ بڕوای باسکراو چەندین پلە هەیە لە پاداشتی ئەوەی کردوویانە ﴿ولیوفیهم اعمالهم وهم لا یظلمون﴾ وەتا خوا بەتێرو تەسەل پاداشتی کارو کردەوەکانیان بداتەوەو ناهەقی و ستەمیشیان لێ ناکرێ ﴿[٢٠] ویوم یعرض الذین کفروا علی النار﴾ وەڕۆژێك ئەوانەی کە بێ باوەڕن بەرامبەر ئاگر رائەنوێنرێن و نیشانیان ئەدرێ ﴿اذهبتم طیباتکم فی حیاتکم الدنیا﴾ پێیان ئەوترێ: ئێوە لە ژیانی دونیادا، هەرچی خۆشیەو، ڕابواردنێکتان هەبوو ئەنجامتاندا ،ئیتر بەشی ئێرەتان نەهێڵایەوە ﴿واستمتعتم بها﴾ وە بەهرەوەر بوون پێیان ﴿فالیوم تجزون عذاب الهون﴾ ئینجا ئەمڕۆش پاداشت دەدرێتەوە بە سزای سەرکز کەر ﴿بما کنتم تستکبرون فی الأرض بغیر الحق﴾، بەهۆی ئەوە کە بەناهەق خۆتان بە زل دادەنا لەسەر زەوی ﴿و بما کنتم تفسقون﴾ وە بەهۆی ئەو گوناهو تاوانەوە دەتانکرد.

**داستانی( هوود )و قەومەکەی:**

جا بۆ دڵدانەوەی پێغەمبەر ﷺ خوای باڵادەست داستانی(هوود)و هۆزەکەی باس دەکاو پێی ئەفەرموێ: ﴿[٢١] واذکر اخا عاد إذ انذر قومه بالأحقاف﴾ وة باسی براکەی هۆزی عاد(هوود) وەبیرخۆت و موسڵمانان بێنە، ئەو کاتەی کە گەلەکەی بێدار کردەوە لە (ئەحقاف)دابە سزای خوا. (ئەحقاف): چەند کێوو تەپۆڵکەیەکی بەرزە لە وڵاتی یەمەن (حەزرەمەوت)دا وە گەلی عادیش لەوێ دەژیان. ﴿وقد خلت النذر من بین یدیه ومن خلفه﴾ بێگومان بێدارکەرەوەو پێغەمبەرانی زۆر بەر لە(هوود) و دوای ئەویش ڕۆشتوون بەوێنەی بیچدار کردنەوەی هوود بۆ هۆزەکەی ﴿الا تعبدوا إلا الله﴾ پێیگوتن: کە جگە لەخوا هیچ شتێك مەپەرستن ﴿إنی اخاف علیکم عذاب یوم عظیم﴾

چونكه من دەترسم ئێوه تووشی سزای ڕۆژێكی دژوارو گەورە ببن, ئەمە ئاگاداریی و بێداركردنەوەكەی هوودی پێغەمبەر بوو بۆ هۆزەكەی ﴿ [٢٢] قالوا اجئتنا لتأفكنا عن آلهتنا﴾ هۆزە خوانەناسەكەی وتیان: ئایا تۆ بۆ ئەوە هاتوویت كه ئێمه لەپەرستنی خواكانمان لا بدەیت؟! ﴿فأتنا بما تعدنا إن كنت من الصادقين﴾ جا ئەگەر ڕاست ئەكەیت، وەرەبۆمان بەوەی بەڵێنمان پێدەدەیت, واته: به سزاكەوه وەره، قەیناكا با ئێمه تیابچین! جا ئەم ئایەتی: (يستعجل بها الذين لا يؤمنون) (٨/٢٤) دووپاتی ئەو پەله پەل و داخوازییەیان دەكاتەوه ﴿ [٢٣] قال إنما العلم عند الله﴾ هوودیش وتی: بەڕاستی زانینی كاتی سزاكە تەنها لای خوایه, من هیچ نازانم و هیچیشم بەدەست نیه ﴿وأبلغكم ما أرسلت به﴾ وه ئەوەتان پێڕادەگەینم پێی نێردراوم پێتان ڕائەگەیەنم ﴿ولكني أراكم قوما تجهلون﴾ و بەلام من ئێوه بەگەلێكی نەزان دەبینم، واته: نازانن پێغەمبەران بەچی نێردراون ﴿ [٢٤] فلما رأوه عارضا مستقبل أوديتهم﴾ جا كاتێ دیتیان لەشێوەی هەورێكدا ڕووبەرووی دۆڵ و شیوەكانیان ئەهات پێیان وابوو هەورێكی باراناوییه ﴿قالوا هذا عارض ممطرنا﴾ وتیان: ئەمه هەورێكه بارانمان بۆ دەبارێنێ.

ئەڵێن: بۆ ماوەیەكی زۆر گەرمایەكیان ئەوقه دەبێ و، بارانیان بۆ نابارێت، جاكاتێ هەورەكەیان دیت دڵیان پێخۆشكردو، هەموو چوون بۆ دۆڵ و شیوەكان و چاوەڕوانی بارانیان لێ ئەكرد ﴿بل هو ما استعجلتم به﴾ گوترا پێیان: نەخێر، ئەوه هەوری باران نیه، بەڵكو ئەو سزایەیه ئێوه پەلەتان بۆ ئەكرد , واته: ئەو سزایەیه ئەتانوت: ئەگەر ڕاست ئەكەیت كەی دێت؟ ﴿ريح فيها عذاب أليم﴾ سزاكەش: بایەكه، جەزرەبەی ئیش پێگەیەنەری تێدایه ﴿ [٢٥] تدمر كل شئ بأمر ربها﴾ بەفەرمانی پەروەردگاری خۆی هەمووشتێك لەناو دەبا ﴿فأصبحوا لا يرى إلا مساكنهم﴾ جا ئیتر وایان بەسەر هات ئاساریان نەدەبینرا جگه له خانووەكانیان ئیتر خۆیان و مەڕو ماڵاتیان و كشتو كاڵ و تاد. . . له ناوچوو, بەفەرمانی خوای لەكارزان ﴿كذلك نجزي القوم المجرمين﴾ ئاوا پاداشتی هۆزه تاوانكارەكان ئەدەینەوه ,جا ئێوەش –ئەی قورەیش!– بیری بكەنەوه له ئەنجامی پاشه ڕۆژی خۆتان.

خاتوو (عائشه) –خوا لێی ڕازیی بێ– ئەڵێت: هەركاتێ پێغەمبەر ﷺ بەئاسۆی ئاسمانەوه هەورێكی دیتبا، هەر ئیشێكی هەبوو با دەستی لێ هەڵدەگرت و ئەی فەرموو: ((اللهم إني أعوذ بك من شر ما فيه)) جا ئەگەر هەورەكه نەمابا، ئەوا سوپاسی خوای گەورەی ئەكرد، ئەگەر بمباباو بارانی باراندبا ئەیفەرموو: ((اللهم! صيبا نافعا)) (مسند امام أحمد ٦/١٩٠). خوایه! بارانێكی بەكەڵك بێ، لەبەشی فەرموودەیەكی تردا –كه ئیمامی (موسليم): ٢/٦١٦.

الجزء السادس والعشرون سورة الأحقاف

۞ وَاذْكُرْ أَخَا عَادٍ إِذْ أَنذَرَ قَوْمَهُ بِالْأَحْقَافِ وَقَدْ خَلَتِ النُّذُرُ مِن بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا اللَّهَ إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿٢١﴾ قَالُوا أَجِئْتَنَا لِتَأْفِكَنَا عَنْ آلِهَتِنَا فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَا إِن كُنتَ مِنَ الصَّادِقِينَ ﴿٢٢﴾ قَالَ إِنَّمَا الْعِلْمُ عِندَ اللَّهِ وَأُبَلِّغُكُم مَّا أُرْسِلْتُ بِهِ وَلَٰكِنِّي أَرَاكُمْ قَوْمًا تَجْهَلُونَ ﴿٢٣﴾ فَلَمَّا رَأَوْهُ عَارِضًا مُّسْتَقْبِلَ أَوْدِيَتِهِمْ قَالُوا هَٰذَا عَارِضٌ مُّمْطِرُنَا بَلْ هُوَ مَا اسْتَعْجَلْتُم بِهِ رِيحٌ فِيهَا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٢٤﴾ تُدَمِّرُ كُلَّ شَيْءٍ بِأَمْرِ رَبِّهَا فَأَصْبَحُوا لَا يُرَىٰ إِلَّا مَسَاكِنُهُمْ كَذَٰلِكَ نَجْزِي الْقَوْمَ الْمُجْرِمِينَ ﴿٢٥﴾ وَلَقَدْ مَكَّنَّاهُمْ فِيمَا إِن مَّكَّنَّاكُمْ فِيهِ وَجَعَلْنَا لَهُمْ سَمْعًا وَأَبْصَارًا وَأَفْئِدَةً فَمَا أَغْنَىٰ عَنْهُمْ سَمْعُهُمْ وَلَا أَبْصَارُهُمْ وَلَا أَفْئِدَتُهُم مِّن شَيْءٍ إِذْ كَانُوا يَجْحَدُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ ﴿٢٦﴾ وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا مَا حَوْلَكُم مِّنَ الْقُرَىٰ وَصَرَّفْنَا الْآيَاتِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٢٧﴾ فَلَوْلَا نَصَرَهُمُ الَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ قُرْبَانًا آلِهَةً بَلْ ضَلُّوا عَنْهُمْ وَذَٰلِكَ إِفْكُهُمْ وَمَا كَانُوا يَفْتَرُونَ ﴿٢٨﴾

٥٠٥

ریوایەتی ئەکا –هاتووە: پاش ئەوە کە خاتوو (عائشە) پرسیاری هۆی بێ تاقەتی لەپێغەمبەر کرد لەکاتی هاتنی هەوردا، ئەویش فەرمووی: (لعله یا عائشة! كما قال قوم عاد: (فلما رواه عارضا مستقبل اودیتهم قالوا هذا عارض ممطرنا) واتە:کێ دەڵێت وەك هەورەکەی گەلی (عاد)نیە؟ ﴿[٢٦] ولقد مكناهم فيما إن مكناكم فيه﴾ وە بێگومان ئەوانمان دەسترۆیشتوو کردبوو لە هێزودارایی, کە ئێوەمان وەك ئەوان دەست رۆیشتوو نەکردبوو، کەچی هیچ کەڵکێکی نەبوو بۆیان ﴿وجعلنا لهم سمعا وابصارا وافئدة﴾ و گوێ و چاوو دڵمان پێدابوون بۆ بینین و بیستن وتێفکرین ﴿فما اغنى عنهم سمعهم ولا ابصارهم ولا افئدتهم من شئ﴾ کەچی نەگوێ و، نە چاوو، نە دڵیان هیچ سوود و کەڵکی نەبوو بۆیان, نەیانزانی لە جێگەی خۆیاندا بەکاریان بێنن، تا لە سزای ئەمرۆ رزگاریان بێت ﴿إذ كانوا يجحدون بآيات الله﴾ چونکە بەڵگەو ئایەتەکانی خوایان نکوولی ئەکرد ﴿وحاق بهم ماكانوا به يستهزئون﴾ وە دەرەنجام ئەو سزایەیئەوان گاڵتەیان پێ ئەکرد دەوری گرتن, جا ئێوەیش –ئەی قورەیش!– وریا بن تا وەك ئەوان دووچار نەبن ﴿[٢٧] ولقد اهلكنا ما حولكم من القرى﴾ بێگومان ئێمە گوندو شارەکانی دەورووبەرتانمان ئەی قورەیش! وەك (عاد، سەموود، سەبا، لووط..) لەناو برد, کاتێ سەرپێچییان کرد ﴿وصرفنا الآيات﴾ و نیشانەو ئایەتی جۆراوجۆرمان خستە بەر چاویان ﴿لعلهم يرجعون﴾ بەشکو بگەڕێنەوە سەر رێی راست ﴿[٢٨] فلولا نصرهم الذين اتخذوا من دون الله قربانا آلهة﴾ باشە ئەوە بۆچی ئەو بتانەی ئەوان – لەباتی خوا – ئەیانپەرستن – بە مەبەستی ئەوەی لە خوا نزیکیان بخەنەوە– یارمەتیان نەدان لەوکاتەدا؟ ﴿بل ضلوا عنهم﴾ بەڵکو لێیان بزربوون , کاتێ سزاکە دەورەیانی گرت ﴿وذلك إفكهم وما كانوا يفترون﴾ ئەوەش ئەنجامی درۆکەیان بوو کە ئەیانوت: لە خوامان نزیک دەکەنەوە,وەئەوەش هەڵیان بەست کەئەیانگوت: ئەوانە خوان وشەریکی خوان!

**جنیی هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ گوێیان لە قورئان گرت:**

﴿[٢٩] وإذ صرفنا إليك نفراً من الجن يستمعون القرآن﴾ وە بیر بێنە ئەو کاتە ئەی موحەممەد ﷺ – وەك حاکم ئەڵێ– کە نۆکەس لە جنۆکەکانمان ناردە لات تا گوێ رابگرن لە قورئان. پێشەوا ئەحمەد لەزوبەیرەوە ئەڵێت: پەیامبەر ﷺ نە ئەو جنۆکانەی دیت، وە نە قورئانیشی بۆ ئەوان خوێند، بەڵکو هەرئەمەبوو کە پێغەمبەر ﷺ جارێك لەگەڵ تاقمێ لە هاوەڵانی خۆیدا بۆ بازاڕی (عوکان) دەرۆیشتن، لەو دەمەیشدا جنۆکەکان رێگری کرابوون لە ئاسمان، جادواتر رۆیشتنەوە بۆ لای هۆزەکەی خۆیان ووتیان: چ ئەڵێن؟! چ روویداوە؟! رێگری کراوین لە ئاسمان..! وتیان: دەبێ شتێکی گرنگ روویدابێ؟ ئادەی بە خۆرهەڵات و خۆرئاوادا برۆن ببینن چ روویداوە؟! ئەوانیش رۆیشتن و بەم لاو بەولادا زۆر گەڕان، سەرەنجام رێیان کەوتە (تیهامە)، پێغەمبەر ﷺ لە (نەخلە) بوو بەمەبەستی بازاڕی عوکان، وەکاتی نوێژی بەیانی بوو، نوێژیان دەکرد، هەندێ لە جنۆکەکانیش گوێیان لە قورئانەکەی پێغەمبەربوو، جا لەنێو خۆیاندا وتیان: ئەمەیە رێی لێگرتووین لە ئاسمان، جا ئیتر گەڕانەوە وتیان: (فقالوا إنا سمعنا قرآنا يهدى إلى الرشد فآمنا به ولن نشرك بربنا احدا) ٧٢/١-٢. جا سوورەتی (قل أوحى إلى أنه استمع نفر من الجن..) هات، خوای گەورەش قسەو وتوو وێژی جنۆکەکانی لەو سوورەتەدا بۆ گێڕایەوە) بوخاری: ٧٣٣. مسلم: ٣٣١/١. بەیهەقی: ٢٢٥/٢. بەڵێ ئەم ریوایەتەو چەند ریوایەتێکی دیکە وادەگەیەنن کە پێغەمبەر ﷺ ئەو جارەیە هەر هەستی بە ئامادەبوونی جنۆکەش نەکردبێ، بەڵکو گوێیان لە قورئانەکەوە بووە، پاشان گەڕانەوە بۆ لای هۆزەکەیان ورووداوەکەیان گێڕایەوەو، ئەوانیش پۆل پۆل و، هۆز هۆز نوێنەریان نارد بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و ئەویش قورئانی بۆ خوێندن و بانگی کردن بۆ ئیسلام و موسڵمان بوون. (شەیتان و جنۆکە) جگە لە (مەلاحیدەو

فەلاسیفە)ی كۆن و (عەلمانی)یەكانی نوێی ئێستا كەسی تر ئینكارو نكووڵییان ناكا (شەیخول ئیسلام ئیبن تەیمیە) دەڵێ: (وجماهیر الأمم یقر بالجن ولهم وقائع یطول وصفها ولم ینكر الجن إلا شرذمة قلیلة من جهال المتفلسفة والأطباء ونحوهم)الفتاوی (١٩/٣٢). وە جگە لەقورئان بەفەرموودەیش بوون و وجوودیان سەلمێنراوە، ئیمامی (بوخاری) لە (ئەبو هورەیرە)وە فەرموودەی دیلەكەی هێناوە: (یا ابا هریرة! مافعل أسیرك..!؟ لەمە درێژترو زیاتر لەسوورەی (جین)دا نووسراوە، دەتوانی سەیرێكی ئەوێ بكەیت. بەڵێ هاتنی ئەو جنۆكانە بۆ گوێگرتن لە قورئان بەڵگەیە بۆ ئەوە كە كۆمەڵێك لەدروستكراوی خوا هەیە.. پێیان ئەڵێن (جن) وئەتوانن بەو شێوەیەكەقورئان هاتووە بیخوێننەوەو بیڵێنەوە.. جائێمەش لەوە زیاتر ناتوانین باسی (جن) بكەین، وە پێویستە بڕوامان بە بوونیشیان هەبێ ئەگەرچی نەشبینرین، چونكە هەر رۆژەی شتێكی نوێ دەرئەكەوێ كەئەگەر پێش پێنج سەدە، باسی ئەو شتانە بكرایە كە ئەمڕۆ دەركەوتوون ئەیانوت: شێت بوون، لەولایشەوە ئێمە هێشتا واین لە سەرەتای رێگادا بۆ دەرخستنی شتە نادیارەكان. ﴿فلما حضروه قالوا انصتوا﴾ ئینجا كاتێ گەیشتن و ئامادەی قورئان خوێندنەكە بوون لەناو یەكتردا وتیان: گوێ بگرن و بێ دەنگ بن، جا كەوابوو (ئەی قورەیش) بۆ ئێوە زۆر نەنگە كە بڕوا ناهێنن پێی ﴿فلما قضی ولوا إلی قومهم منذرین﴾ ئینجا كە خوێندنی قورئانەكە تەواوبوو, خێرا گەڕانەوە بۆ لای قەومەكەیان بە ترساندنیان لە سزای خوا ﴿٣٠ قالوا یا قومنا إنا سمعنا كتابا أنزل من بعد موسی﴾ گەڕانەوەو وتیان ئەی گەلەكەمان! بێگومان ئێمە گوێمان لە كتێبێكەوە بوو كە لەپاش موسا دابەزێنراوە. (ئیبن عەبباس) ئەڵێت: ئەو جنۆكانە هەواڵی عیسایان نەئەزانی ﴿مصدقا لما بین یدیه﴾ سەلمێنەری كتێبەكانی پێش خۆیەتی, واتە: تەورات ئەسەلمێنێ و ددانی پێدا دەنێ ﴿یهدی إلی الحق وإلی طریق مستقیم﴾ رێنوێنی دەكا بۆ هەق و بۆ رێی راست ﴿٣١ یا قومنا أجیبوا داعي الله وآمنوا به﴾ وتیان:ئەی خزمینە! وەڵامی بانگبەرەكەی خوا بدەنەوەو بڕواش بە خوا بێنن ﴿یغفر لكم من ذنوبكم﴾ لە گوناهەكانتان خۆش دەبێت ﴿ویجركم من عذاب ألیم﴾ و لەسزای ئێش پێگەیەنەریش دەتانپارێزێت ﴿٣٢ ومن لا یجب داعی الله فلیس بمعجز فی الأرض﴾ خۆهەر كەسێك وەڵامی بانگخوازی خوا نەداتەوە، ناتوانێ لە زەوییدا لە دەستی خوا دەرچێ و هەڵێ ﴿ولیس له من دونه أولیاء﴾ و جگە لەخواش هچ یارو دۆستێكی نییە "تا بتوانێ لەو رۆژەدا یارمەتی بدا, (لێرەدا گفتوگۆی جنۆكەكان تەواو دەبێ و ئەفەرموێ: ﴿أولئك فی ضلال مبین﴾ ئەوانەی باوەڕ ناهێنن لە گومڕاییەكی ئاشكرادان.



وَإِذْ صَرَفْنَآ إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقُرْءَانَ فَلَمَّا
حَضَرُوهُ قَالُوٓا۟ أَنصِتُوا۟ ۖ فَلَمَّا قُضِىَ وَلَّوْا۟ إِلَىٰ قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ
٢٩ قَالُوا۟ يَٰقَوْمَنَآ إِنَّا سَمِعْنَا كِتَٰبًا أُنزِلَ مِنۢ بَعْدِ مُوسَىٰ
مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ يَهْدِىٓ إِلَى ٱلْحَقِّ وَإِلَىٰ طَرِيقٍ مُّسْتَقِيمٍ
٣٠ يَٰقَوْمَنَآ أَجِيبُوا۟ دَاعِىَ ٱللَّهِ وَءَامِنُوا۟ بِهِۦ يَغْفِرْ لَكُم مِّن
ذُنُوبِكُمْ وَيُجِرْكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ٣١ وَمَن لَّا يُجِبْ دَاعِىَ ٱللَّهِ
فَلَيْسَ بِمُعْجِزٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَيْسَ لَهُۥ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءُ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ
فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ٣٢ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلْأَرْضَ وَلَمْ يَعْىَ بِخَلْقِهِنَّ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحْـِۧىَ ٱلْمَوْتَىٰ ۚ بَلَىٰٓ
إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ٣٣ وَيَوْمَ يُعْرَضُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ عَلَى ٱلنَّارِ
أَلَيْسَ هَٰذَا بِٱلْحَقِّ ۖ قَالُوا۟ بَلَىٰ وَرَبِّنَا ۚ قَالَ فَذُوقُوا۟ ٱلْعَذَابَ بِمَا
كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ٣٤ فَٱصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْعَزْمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ
وَلَا تَسْتَعْجِل لَّهُمْ ۚ كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَ مَا يُوعَدُونَ لَمْ يَلْبَثُوٓا۟ إِلَّا
سَاعَةً مِّن نَّهَارٍۭ ۚ بَلَٰغٌ ۚ فَهَلْ يُهْلَكُ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ٣٥

## سُورَةُ مُحَمَّدٍ
آياتها ٣٨ — مدنية ٤٧

**ژیانەوەی پاش مردن:**

﴿٣٣ الم يروا أن الله الذى خلق السموات والأرض﴾ ئایا ئەو بێ بڕوایانە نەیازانیوە کە ئەوخوایەی ئاسمانەکان و زەوی دروست کردو ﴿ولم يعى بخلقهن﴾ بەهۆی دروستکردنیشیانەوە بێ هێز نەکەوتوو ماندوو نەبوو ﴿بقادر على أن يحى الموتى﴾ بەتوانایە کە مردوەکان زیندوو بکاتەوە؟ ﴿بلى إنه على شئ قدير﴾ بەڵێ بێگومان ئەو زاتە بەسەر هەموو شتێکدا دەسەڵاتدارە,چۆن لە سەرەتاوە دروستیکردوون، هەرئاوایش بۆجارێکی دی زیندوویان ئەکاتەوە ﴿٣٤ ويوم يعرض الذين كفروا على النار﴾ وە ئەو ڕۆژەیان وەبیر بێنەوە کە خوا نەناس و بێ بڕوایان نیشانی دۆزەخ ئەدرێن ﴿أليس هذا بالحق﴾ پێیان ئەوترێ: ئایا ئەم سزایەی ئێستاکە ئێوە ئەیچێژن هەق و ڕاست نیە؟! ﴿قالوا بلى وربنا﴾ هەموو بەیەکدەنگ ئەڵێن: بەڵێ، بەپەروەردگارمان سوێندبێ, ڕاستە ﴿قال فذوقوا العذاب بما كنتم تكفرون﴾ خوا دەفەرموێ: جا مادەم وایە سزاکە بچێژن, بەهۆی ئەوەی باوەڕتان نەهێناو کافر بوون.

**لێبڕاو نەبەزاو بە، وەکو پێغەمبەرانی بەر لەخۆت:**

﴿٣٥ فاصبر كما صبر أولوا العزم من الرسل﴾ پاش ئەوەی خوا بە یەکزانین و زیندوو بوونەوەی بە بەڵگەو نیشانەوە سەلماند، ئەفەرمووێ: جا ئارامت بێ و خۆڕاگربە ئەی موحەممەد! ﷺ هەروەکو پەیامبەرەخاوەن (عەزم)ەکان خۆیانیان ڕاگرت لەبەردەم ئەو هەموو ئەزیەت و ئەشکەنجەدا.

ئولولعەزم ئەمانەن: (نووح، ئیبراهیم، موسا، عیسا) - عليهم الصلاة والسلام-. (مەسروق) ئەڵێ: خاتوو عائیشە خوای لێ ڕازی بێ پێی وتم: کە پێغەمبەر ﷺ هەر ئەوەندە بە ڕۆژوو دەبوو، هەر ئەوەندە خۆی برسی دەکرد , دیسان هەر ئەوەندە بەڕۆژوو دەبوو، ئەوجا دەیفەرموو: (يا عائشة! إن الدنيا لا تنبغي لمحمد ولا لآل محمد، يا عائشة! إن الله لم يرض من أولي العزم من الرسل إلا بالصبر على مكروهها، والصبر عن محبوبها، ثم لم يرض مني الا أن يكلفني ما كلفهم، فقال: (فاصبر كما صبر اولوا العزم من الرسل) و إني - والله- لأصبرن كما صبروا جَهدي، ولا قوة إلا بالله) الدر المنثور: ٤٥٤/٧. ئەی عائیشە! بێگومان ئەم دونیایە ناگونجێ و دەس نادا، نە بۆ موحەممەد خۆی و، نە بۆ ئال و بەیتی و خانەوادەی محەممەد، ئەی عائیشە! بەڕاستیی خوا لە (ئولول عەزم)ەکان ڕازی نابێ مەگەر بەخۆ ڕاگرتن لە بەرامبەر ناڕەحەتی و ناخۆشی و، خۆشیەکانەوە، پاشان لەمن -بەتایبەت- ڕازی نابێ مەگەر چ تەکلیفێکی لەوان کردبێ، لەمنیشی بکا، جا ئایەتی (فاصبر كما صبر أولوا العزم من الرسل)ی خوێندنەوەو فەرمووی: بەڕاستیی - سوێند بەخوا- من ئارام ئەگرم هەر وەکو ئەوان لەسەر ناڕەحەتی ئارامیان گرت، بۆ ئەمەیش هێزو تواناو سەرکەوتن هەر بەدەستی خوایە. ﴿ولا تستعجل لهم﴾ و بۆ ئازارو سزادانیان پەلە مەکە ونزای شەڕیان لێ مەکە, چونکە ئەو سزایەیان هەر ئەوقە ئەبێت ﴿كأنهم يوم يرون ما يوعدون لم يلبثوا إلا ساعة من نهار﴾ ئەو ڕۆژە کە بەڵێنیان دراوەتێ، هەر کاتێك پێشهات، وا دەزانن تەنها کاتێکی زۆر کەمیان لەڕۆژێکدا پێچووە، ﴿بلاغ﴾ ئەم قورئانە ڕاگەیاندنێکی تەواوە بۆیان ﴿فهل يهلك إلا القوم الفاسقون﴾ جا ئایا جگە لەگەلی لە سنوور دەرچووان, کەسێکی تر بەسزا تیا ئەچێ؟! دیارە نا، کە ئەمەش ئەوپەڕی دادگەری و دادپەروەری خوای گەورەیە.

کۆتایی سوورەتی (ئەحقاف).

(ولله الحمد والمنة).

*** *** ***

## ٤٧- سوورەتی ( موحەممەد )ـە

## مەدەنییەو ( ٣٨ )ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتی (موحەممەد)ـە بەسوورەتی (قتال)یش ناوبراوە، ئەگەرچی ناوە بنەڕەتیەکەشی پڕ بەپڕ ئەمە هەڵدەگرێت، چونکە باسی جەنگاندنە لەگەڵ دوژمنانی دینی خوادا: ئینجا باسی شێوەی جەنگکردن، دیلکردن، دەستکەوت و غەنیمەت، فێڵ وفەرەجی دوو ڕووەکان دەکات.

بەئاشکرا لەگەڵ بێ بڕواکاندا جەنگ ڕائەگەیەنێت، پاشان فەرمان بە موسڵمانەکان ئەدا - بۆ پاککردنەوەی زەویی لەچڵك و چەپەڵی خوانەناسی و بێ بڕوایی- بجەنگن, بجەنگێن تا شەوکەتی کافران ئەشکێنن، ئەوسا لەپاش کوشتارێکی زۆر دیلیان دەکەن، بۆ دواتریش ڕێگەی عیززەت و سەرکەوتن دەست نیشان ئەکات، هاوڕێ لە گەڵ باسکردنی سیفاتی دووڕووەکاندا, جا هەر بەو شێوەیە درێژە بەباسی مەسەلەی جیهاد ئەدات تا سەرکەوتن..

**جەزای موسڵمانان و، تۆڵەی کافران:**

﴿بسم الله الرحمن الرحيم * [1] الذين كفروا وصدوا عن سبيل الله﴾ ئەو کەسانەی بێ باوەڕبوون و بەر هەڵستی ڕێگەی دینی خوایان دەکرد و نەیاندەهێشت مەردوم بڕوا بێنن بە بەرنامەکە ی خوا ﴿اضل اعمالهم﴾ خوا کارەکانیانی باتڵ و پوچەڵ کردوونەوە، چونکە بۆ خوایان نەکردووە. کەوابوو هەرشتێك ئەنجام بدەن -وەك کۆمەککردن بەیەکترو، سەرداریخزمان و دۆستان و، یارمەتیدانی هەژاران.. هتد- بایەخ و نرخێکی لای خوا نابێ، وەك لەجێگایەکی تردا ئەفەرموێ: (وقدمنا إلى ما عملوا من عمل فجعلناه هباء منثورا (٢٣/٢٥). ﴿[2] والذين آمنوا وعملوا الصالحات﴾ ئەوانەش کە بڕوایان هێنابووو کارەچاکەکانیان کردبوو ﴿وآمنوا بما نزل على محمد﴾ بڕوایان هێنابە قورئان کەبۆ موحەممەد ﷺ دابەزێنراوە ﴿وهو الحق من ربهم﴾ وە ئەوەشە ئەو هەقە لەلایەن پەروەردگاریانەوە هاتووەو، کراوە بە بەرنامەی ژیانیان ﴿كفر عنهم سيئاتهم واصلح بالهم﴾ خوا گوناهەکانیان ئەبەخشێ وحاڵیان چاك ئەکات لەدین و دنیادا ﴿[3] ذلك بأن الذين كفروا اتبعوا الباطل﴾ ئەوەیش واتە:پووچەڵکردنەوەی کارو کردەوەیان بەهۆی ئەوەوەیە:ئەوانەی کە بێ بڕوان و شوێن ناهەق و ڕێگەی پووچەڵکەوتوون ﴿وان الذين آمنوا اتبعوا الحق من ربهم﴾ و ئەوانەیش بڕوایان هێناوە، پەیڕەویان لەو هەقە کردووە لەلایەن پەروەردگاریانەوەهاتووە,بۆیە ئەویش گوناهەکانیان ئەسڕێتەوەو کاروباریان ڕێك و پێك ئەکات ﴿كذلك يضرب الله للناس امثالهم﴾ وەك خوا پاشەڕۆژی هەردوولای ڕۆشنکردەوە, هەر ئاوایش ئەحواڵیان بۆ خەڵك ڕوون دەکاتەوە, بۆ ئەوەی پەندو ئامۆژگاری لێ وەرگرن.

الجزء السادس والعشرون | سورة محمد

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ أَضَلَّ أَعۡمَٰلَهُمۡ ١ وَٱلَّذِينَ
ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَءَامَنُواْ بِمَا نُزِّلَ عَلَىٰ مُحَمَّدٖ وَهُوَ ٱلۡحَقُّ مِن
رَّبِّهِمۡ كَفَّرَ عَنۡهُمۡ سَيِّـَٔاتِهِمۡ وَأَصۡلَحَ بَالَهُمۡ ٢ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ
ٱتَّبَعُواْ ٱلۡبَٰطِلَ وَأَنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّبَعُواْ ٱلۡحَقَّ مِن رَّبِّهِمۡۚ كَذَٰلِكَ يَضۡرِبُ
ٱللَّهُ لِلنَّاسِ أَمۡثَٰلَهُمۡ ٣ فَإِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَضَرۡبَ ٱلرِّقَابِ حَتَّىٰٓ
إِذَآ أَثۡخَنتُمُوهُمۡ فَشُدُّواْ ٱلۡوَثَاقَ فَإِمَّا مَنَّۢا بَعۡدُ وَإِمَّا فِدَآءً حَتَّىٰ تَضَعَ ٱلۡحَرۡبُ
أَوۡزَارَهَاۚ ذَٰلِكَ وَلَوۡ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَٱنتَصَرَ مِنۡهُمۡ وَلَٰكِن لِّيَبۡلُوَاْ بَعۡضَكُم
بِبَعۡضٖۗ وَٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَلَن يُضِلَّ أَعۡمَٰلَهُمۡ ٤ سَيَهۡدِيهِمۡ
وَيُصۡلِحُ بَالَهُمۡ ٥ وَيُدۡخِلُهُمُ ٱلۡجَنَّةَ عَرَّفَهَا لَهُمۡ ٦ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُوٓاْ إِن تَنصُرُواْ ٱللَّهَ يَنصُرۡكُمۡ وَيُثَبِّتۡ أَقۡدَامَكُمۡ ٧ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ
فَتَعۡسٗا لَّهُمۡ وَأَضَلَّ أَعۡمَٰلَهُمۡ ٨ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ كَرِهُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ
الحزب ٥١ فَأَحۡبَطَ أَعۡمَٰلَهُمۡ ٩ ۞ أَفَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرُواْ كَيۡفَ
كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۖ دَمَّرَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡۖ وَلِلۡكَٰفِرِينَ أَمۡثَٰلُهَا ١٠
ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ مَوۡلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَأَنَّ ٱلۡكَٰفِرِينَ لَا مَوۡلَىٰ لَهُمۡ ١١

٥٠٧

**کاتێ تووشی بێ دین و خوانەناسان بوون لە ملیان دەن:**

پاش ئەوەی خوای جوانکار بە ئاشکرا جەنگی راگەیاند لەگەڵ ئەو خوا نەناس و بێ بڕوایانەدا، ئینجا موسڵمانەکان هەڵ دەنێ بۆیی و دەفەرمووێ: ﴿٤ فإذا لقيتم الذين كفروا﴾ جا کاتێ گەیشتن بەبێ بڕواکان لەجەنگدا ﴿فضرب الرقاب﴾ لەگەردنیان بدەن، واتە: ملیان بپەڕێنن و سەریان لەلاشەیان بکەنەوە ﴿حتى إذا أثخنتموهم﴾ بجەنگن تاکاتێ لاوازیان دەکەن بەکوشتار لێکردنێکی زۆرو شکاندنیان ﴿فشدوا الوثاق﴾ ئنجائەوەی ماوە دیلی بکەن و، مەحکەم بیان بەستنەوەو چاودێرییان بکەن ڕانەکەن ﴿فإما مناً بعد﴾ئەوسا یان بە خۆڕایی و منەت خستنە سەریان، ئازادیان بکەن، ئەگەر پێشەوای موسڵمانان پێی چاك بوو ﴿وإما فداء﴾ یان بەفیدیەو بریتیی، واتە: دیل بەدیلیان پێ بکەن، یان شتێکیان لێ وەرگرن، بەڵام ئەمە دوای ئەوەیە شەوکەت و پەڕوباڵیان دەشکێت و دەسەڵاتی جەنگیان نامێنێ. (ئیبن کەسیر) دەڵێ: لەوە دەچێ ئەم ئایەتە پاش ڕووداوەکەی (بەدر) هاتبێ، چونکە لەوێ بەهۆی ڕاگرتن و ئازاد کردنی دیلەکانەوە – پێش شکاندنی شەوکەتیان – (عیتاب) و گلەیی هاتە سەریان، وەك ئەفەرمووێ: (ماکان لنبی أن یکون لە أسری حتی یثخن في الأرض)(٥٧/٨). پاشان هەندێ دەڵێن: ئەم ئایەتی سوورەتی(قیتال)ە، بەئایەتی (فإذا انسلخ الأشهر الحرم فاقتلوا المشركين حيث وجدتموهم) لە سوورەتی (بەرائە) سڕاوەتەوەومەنسوخە، ئەگەرچی زۆربەی زانایان ڕایان لەسەر ئەوەیە کە نەسڕاوەتەوەو، (پێشەوا) بۆ خۆی دەسەڵاتی هەیە لەنێوان ئازاد کردنی دیلەکاندا بەمنەت و خۆڕایی، یان بەبارمتەو بریتی، یان بەکوشتن، یەکێکیان هەڵبژێرێ. بەبەڵگەی ئەوەکە پێغەمبەر ﷺ لەنێو دیلەکانی (بەدر)دا (نەزری کوڕی حاریس)ـەو (عوقبەی کوڕی ئەبی موعەیت)ی کوشت. ﴿حتى تضع الحرب أوزارها﴾ تاجەنگ تەواو دەبێ.

بەڵێ.. جەنگ گەلێك کەڵك و سوودی هەیە، لەوانە: لەشی مرۆڤ بەهێز دەکات، تەکنەلۆژیا گەشە دەکات، گەل زیاددەکات،مرۆڤەکان هۆشیار ئەبنەوە، ستەمکارانیش تیا ئەچن. دەڵێن: (ئەرەستۆ) بەئەسکەندەری وتووە: ئاسایش و پاڵدانەوە، زیانی گەورە دێنی بە سەرگەلدا، بۆیەوتراوە:ئەگەر ویستت گەلێك سەرکەوێ بیخەرە جەنگەوە،ئەوکاتە دەرگای بەختیاریی بۆ ئەکرێتەوە، هەرگەلێکیش خۆی بدزێتەوە لەدیفاع لەخۆیو،حەز بەدانیشتن وپاڵدانەوەبکات، ئەوە خۆی بردۆتە سەر لێواری تیاچوون (تەفسیری مەراغیی). ﴿ذلك﴾ ئەوە بڕیاریخوا بوو: جەنگ لەگەڵ بێ بڕوایاندا، دیل کردنیان، پاشان بەرەڵا کردنیان بەو شێوەیە، وە یان بەهەر شێوەیەك پێشەوا بڕیاری بۆبدا. ﴿ولو يشاء الله لانتصر منهم﴾ ئەگەر خوا بیویستبا ،خۆی تۆڵەی لێ وەر ئەگرتن و لەناوی ئەبردن، بەبێ ئەوەی فەرمان بەئێوە بکات جەنگیان لەگەڵ بکەن ﴿ولكن ليبلوا بعضكم ببعض﴾ بەڵام ئەوەی نەویست ، بۆ ئەوەی بەیەکتر تاقیتان بکاتەوە، واتە:بۆ ئەوە ئێوە بەکافران تاقیبکاتەوە بە جەنگ و جیهاد ﴿والذين قتلوا فى سبيل الله﴾ وە ئەوانەی لەڕێی خوادا کوژران ﴿فلن يضل اعمالهم﴾خوا کارو هەوڵی ئەوانە لەناو نابا ،بەڵکو بەچەند قات بۆیان زیاد ئەکات ﴿٥ سيهديهم﴾ لەدونیاشدا ڕێنمایان ئەکات بۆ کاری چاك و هۆکارەکانی بردنە بەهەشت ﴿ويصلح بالهم﴾ کاروباریان بۆ ئاسان دەکاو،حاڵیشیان چاك ئەکات ﴿٦ ويدخلهم الجنة عرفها لهم﴾ وئەیانباتە بەهەشتەوە کە بەجۆرەها شێوە بۆی باسکردوون ، بەشێوەیەك کە هەموو کەسێك جێگای خۆی ئەزانێ و لێی ون نابێت، هەروەك ئەو ڕۆژە لەدایك بووبن ئاشنان پێی.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (يعطى الشهيد ست خصال: عند أول قطرة من دمه: تكفر عنه كل خطيئة، ويرى مقعده من الجنة، ويزوج من الحور العين، ويأمن من الفزع الأكبر، ومن عذاب القبر، ويحلى حلة الإيمان).(مسند الإمام

أحمد: ٢٠٠/٤. شەهید هەر لەڕژانی یەکەم دڵۆپی خوێنیەوە شەش شتی ئەدرێتێ: هەموو تاوانێکی ئەپۆشرێ، جێی خۆی لەبەهەشتدا ئەبینێ، لە حورەلعەینەکان ژنی ئەدرێتێ، لەترسە گەورەکەی قیامەت بێ خەم ئەکرێ، لەعەزاب و سزای گۆڕ رزگاری دەبێ، جلکی رازاوەی ئیمانی لەبەر دەکرێ.

لەڕیوایەتێکدا هاتووە: (یشفع الشهید فی سبعین من أهل بیته). ئەبوو داود: ٢٥٢٢. شەهید شەفاعەتی حەفتا کەس لە بنەماڵەو خانەوادەکەی دەکا.

### ئەر پشتیوانی ئیسلام بیت، خواش پشتیوانته:

﴿[٧] یا أیها الذین آمنوا إن تنصروا الله ینصرکم﴾ ئەی ئەوانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە! دڵنیابن ئەگەر ئێوە یارمەتیئایینەکەی خوا بدەن، ئەوا بێگومان خوایش یارمەتی ئێوە دەدا و، بەسەر دوژمنانتاندا سەرتان ئەخات، ﴿ویثبت أقدامکم﴾ وەپێکانتان لە جێگاکانی جەنگدا – بە زەفەرو تەمکین لە زەویدا– جێگیر دەکات ﴿[٨] والذین کفروا فتعسا لهم﴾ و ئەوانەش کە بێ باوەڕبوون ،خوا لەنایان دەبا ﴿وأضل أعمالهم﴾ کارەکانیشیان پووچەڵ ئەکاتەوە، واتە: پاداشیان لەسەر ناداتەوە ﴿[٩] ذلك بأنهم کرهوا ما أنزل الله﴾ ئەوەش لەبەرئەوەیە کە بەڕاستیی ئەوان رقیان لەوپەیامە دەبووەوە خوا دایبەزاندووە ﴿فأحبط أعمالهم﴾ جاخوایش کارەکانیانی بێ ئاکام کردەوە. (حبوط) لە بنەڕەتا بریتیە لە ئاوسان و (با کردنی) سکی ئاژەڵ، بەهۆی جۆرە گیایەکەوە کە دەیخوات سەرەنجام ئەیکوژێ و تیا ئەچێ، هەر بەو شێوەیەش کاری بێ بڕواکان زۆرو گەورە ئەبێ، تا دەرەنجام خوای گەورە پووچەڵی ئەکاتەوەوسوودی نامێنێ بۆیان.

### ئاگر بۆ کافرانەو، بەهەشتیش بۆ پارێزکاران:

﴿[١٠] أفلم یسیروا فی الأرض فینظروا کیف کان عاقبة الذین من قبلهم﴾ ئایائەو بێ باوەڕانە بەڕووی زەویدا نەچوون ، تا سەیربکەن چۆن بووە پاشە ڕۆژی ئەوانەی پێشیان؟ ﴿دمر الله علیهم﴾ هەرچیەکیان هەبوو خوا لەناوی بردو، ناوچە و وڵاتی وێرانکردن و، تاقیمال و منداڵی نەهێشتن ﴿وللکافرین أمثالها﴾ وە بۆ هەموو بێ باوەڕەکانیش وێنەو ئەمسالی ئەو پاشە ڕۆژە هەیە ﴿[١١] ذلك بأن الله مولی الذین آمنوا﴾ ئەوپاداشتەش (سەرخستنی باوەڕداران و،تێکشکاندنی بێباوەڕان) لەبەر ئەوەیە کە بەراستیی خوا پشتیوانی ئەوانەیە بڕوایان هێناوە ﴿وأن الکافرین لا مولی لهم﴾ بێ بڕوایانیش هیچ سەرپەرشتیکارو یارمەتیدەرێکیان نیە. (قەتادە) ئەڵێت: ئەم ئایەتە لە شیوی (ئەبوو تالیب)دا هات، ئەو کاتەی کە موشریکان ئەیانوت: ئێمە (عوززا)مان هەیەو، ئێوە نیتانە! پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((قولوا: الله مولانا ولا مولی لکم)) فتح الباري: ١٨٨/٦. واتە: ئێوەش بڵێن: ئێمەش (الله) پشتیوانمانە، وەئێوە هیچ پشتیوانێکتان نیە. ﴿[١٢] إن الله یدخل الذین آمنوا وعملوا الصالحات جنات تجري من تحتها الأنهار﴾، بێگومان ئەو کەسانەی کە بڕوایان هێناوەو کارە چاکەکانیان ئەنجام داوە خوا ئەیانباتە نێو چەندین باخاتی بەهەشتەوە کە چۆمە ئاوو تاڤگە بەبن دارەکانییدا دێت و دەڕوا ﴿والذین کفروا یتمتعون ویأکلون﴾ و ئەوانەش وا بێ باوەڕبوون، لەزەت ئەبەن و ئەخۆن لەدنیادا ﴿کما تأکل الانعام﴾ وەك ئاژەڵ دەخۆن و،بیری هیچ شتێکیان لا نیە ﴿والنار مثوی لهم﴾ ئاگریش جێیە بۆیان ،واتە: چەند ڕۆژێ رائەبوێرن، بەڵام دەرەنجامیان دۆزەخە، پێغەمبەر ﷺ دەربارەی خواردنی باوەڕدارو بێباوەڕ دەفەرمووێ: ((المؤمن یأکل فی معی واحد، والکافر یأکل فی سبعة أمعاء)) فتح الباری: ٤٤٦/٩. واتە: موسڵمان خواردن دەکاتە یەك ریخۆڵەوە، بەڵام کافرو خوانەناس دەیکاتە نێو حەوت ریخۆڵەوە، مەبەست ئەوەیە کە ئیماندارحەلاڵ خۆرو کەمخۆرە، بەڵام خوا نەناس زۆر خۆرەو

گوێی لەحەڵاڵ و حەرام نیە. ﴿١٣ وكأين من قرية هى اشد قوة من قريتك التى اخرجتك﴾ وەزۆر شارنشین بەهێزتر لە شارنشینانی ئەو شارەی تۆیان دەرکرد لێی ﴿اهلكناهم فلا ناصر لهم﴾ هەمووشیانمان لەناو بردن و هیچ یارمەتیدەرێکیشیان نەبوو ,جا ئەبێ ئەمان بەتەمای چی بن؟. (ئیبن عەباس) ئەڵێ: کاتێ پێغەمبەر ﷺ لە مەککە وەدەر نراو لەئەشکەوتەکە خۆی حەشار دا رووی لە مەککە ناو فەرمووی: (أنت أحب بلاد الله إلى الله، وأنت أحب بلاد الله الي، ولولا ان المشركين أخرجوني لم أخرج منك). (ئیبن ئەبی حاتەم). واتە: تۆ لەهەموو شارەکان لای خوا خۆشەویستتریت، هەروەها لای منیش لەهەمووان خۆشەویستریت، خۆ ئەگەر موشریکەکان دەریان نەپەڕانابام، قەت لێت نەئەچوومە دەرێ.

الجزء السادس والعشرون — سورة محمد

إِنَّ ٱللَّهَ يُدْخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن
تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يَتَمَتَّعُونَ وَيَأْكُلُونَ كَمَا تَأْكُلُ ٱلْأَنْعَٰمُ
وَٱلنَّارُ مَثْوًى لَّهُمْ ﴿١٢﴾ وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ هِىَ أَشَدُّ قُوَّةً مِّن قَرْيَتِكَ
ٱلَّتِىٓ أَخْرَجَتْكَ أَهْلَكْنَٰهُمْ فَلَا نَاصِرَ لَهُمْ ﴿١٣﴾ أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ
مِّن رَّبِّهِۦ كَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ وَٱتَّبَعُوٓا۟ أَهْوَآءَهُم ﴿١٤﴾ مَّثَلُ ٱلْجَنَّةِ
ٱلَّتِى وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ ۖ فِيهَآ أَنْهَٰرٌ مِّن مَّآءٍ غَيْرِ ءَاسِنٍ وَأَنْهَٰرٌ مِّن لَّبَنٍ لَّمْ
يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُۥ وَأَنْهَٰرٌ مِّنْ خَمْرٍ لَّذَّةٍ لِّلشَّٰرِبِينَ وَأَنْهَٰرٌ مِّنْ عَسَلٍ مُّصَفًّى ۖ
وَلَهُمْ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ وَمَغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ ۖ كَمَنْ هُوَ خَٰلِدٌ فِى ٱلنَّارِ
وَسُقُوا۟ مَآءً حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَآءَهُمْ ﴿١٥﴾ وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُ إِلَيْكَ
حَتَّىٰٓ إِذَا خَرَجُوا۟ مِنْ عِندِكَ قَالُوا۟ لِلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ مَاذَا قَالَ ءَانِفًا ۚ
أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ وَٱتَّبَعُوٓا۟ أَهْوَآءَهُمْ ﴿١٦﴾ وَٱلَّذِينَ
ٱهْتَدَوْا۟ زَادَهُمْ هُدًى وَءَاتَىٰهُمْ تَقْوَىٰهُمْ ﴿١٧﴾ فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا
ٱلسَّاعَةَ أَن تَأْتِيَهُم بَغْتَةً ۖ فَقَدْ جَآءَ أَشْرَاطُهَا ۚ فَأَنَّىٰ لَهُمْ إِذَا جَآءَتْهُمْ
ذِكْرَىٰهُمْ ﴿١٨﴾ فَٱعْلَمْ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ وَٱسْتَغْفِرْ لِذَنۢبِكَ
وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مُتَقَلَّبَكُمْ وَمَثْوَىٰكُمْ ﴿١٩﴾

٥٠٨ — ويقول الذين

**هەق پەرست و ئارەزوو پەرست, وەکو یەك نین:**

﴿١٤ افمن كان على بينة من ربه﴾ ئایا کەسێك لەلایەن پەروەردگاریەوە بەڵگەیەکی روونی هەبێت ﴿كمن زين له سوء عمله﴾ وەکو ئەو کەسە وایە کردەوەخراپەکانی لەبەرچاو ڕازێندرابێتەوەو بۆی شیرین کرابێ ﴿واتبعوا اهواءهم﴾ وە لەهەواوئارەزووی خۆیان پەیرەوییان کردبێ؟

**پەسنی بەهەشت و رووبارەکانی:**

﴿١٥ مثل الجنة التى وعد المتقون﴾ نموونەو سیفەتی ئەوبەهەشتەی بە خۆپارێزان بەڵێن دراوە لە پاشەڕۆژدا پێیان بدرێت بەم شێوەیە:

١- ﴿فيها انهار من ماء غير آسن﴾ رووباری زۆری لە ئاوی خاوێن و نەگۆڕاوو بێ بۆنی تێدایە.

٢- ﴿وانهار من لبن لم يتغير طعمه﴾ وە زۆر رووباری تێدایە, لەشیری سپی و جوان کەبەهۆی مانەوە - وەك شیری دونیا- تامی نەگۆڕاوە، چونکە لەگوانی ئاژەڵ نایەتە دەرێ، وەك دەفەرموێ: (لم يخرج من ضروع الماشية).

٣- ﴿وانهار من خمر لذة للشاربين﴾ چەندین چەم و رووباری تێدایە, لە شەراب و عەرەقێك - کە بۆ ئەوانەی ئەیخۆنەوە - زۆر خۆش و بە مەزەیە , واتە: دوورە لە هەر وەسفەێکی عەرەقی دونیادا، وەك لەسورەتێکی تردا ئەفەرموێ: (لافيها غول ولا هم عنها ينزفون). (٤٧/٣٧)، یان دەفەرموێ: (لا يصدعون عنها ولا ينزفون). (١٩/٥٦).

٤- ﴿وانهار من عسل مصفى﴾ چەندان چەم و رووباری تێدایە, لە هەنگوینی پاڵاوتە و بێگەرد, لە مۆم و لە هەر شتێکی تر, لەهەنگوینی دونیادا هەیە. لەفەرمودەیەکدا - کە پێشەوا (ئەحمەد)و (ترمذی)هێناویانە- هاتووە: لە بەهەشتا رووباری شیرو ئاوو هەنگوین وشەراب هەیە، پاشان هیمان چۆم گەلی دیکەشی لێ جیا دەبێتەوە.

٥- ﴿ولهم فيها من كل الثمرات﴾ لەوێ جۆراو جۆری میوەیان بۆ هەیە.

٦- ﴿ومغفرة من ربهم﴾ لێبوردن و لێخۆشبوونی پەروەردگاریانیان بۆ هەیە، کە ئەوەچاکترین شتە ﴿کمن هو خالد فی النار﴾ ئایا ئەوانە کە ئەو هەموو نازو نیعمەتەیان هەیە، وەك ئەوکەسە وایە کە هەمیشە لە ئاگری دۆزەخدا بێت؟ ﴿وسقوا ماء حمیما﴾ و ئاوی کوڵ بە کوڵیان پێدەخۆنەوەکاتێ تینوویان دەبێت" ﴿فقطع امعاءهم﴾ جا ڕیخۆڵەیان پارە پارە ئەکا، ئایا ئەو دوو دەستەیە وەك یەك وان؟!

**دووڕازەکان گوێ دەگرن و ناییبیسن:**

﴿[١٦] ومنهم من یستمع إلیك﴾ ئەی موحەممەد! ﷺ هەندێ لەو دوو ڕووانە گوێت بۆ ئەگرن ﴿حتی إذا خرجوا من عندك﴾ هەتاکاتێ لە لای تۆ هەڵئەسن و بەجێت دێڵن ﴿قالوا للذین أوتوا العلم ماذا قال آنفا﴾ لەو هاوەڵانەیان - لە ئەمسالی (ئیبن عەباس، ئیبن مەسعود)- زانیارییان پێدراوە، دەپرسن و ئەڵێن: ئەرێ ئەوە ئێستا ئەم پیاوە (موحەممەدﷺ) چیگوت؟ ﴿أولئك الذین طبع الله علی قلوبهم﴾، ئا ئەوانە خوا مۆری بەد بەختی ناوە بەسەر دڵیاندا ﴿وا تبعوا أهواءهم﴾ وەشوێنی هەواو هەوەس و ئارەزووی خۆیان کەوتوون،بۆیە لەهیچ تێناگەن ﴿[١٧] والذین اهتدوا زادهم هدی﴾ ئەوانەش ڕێ و ڕێبازی دروستیان گرتە بەر،خوا هیدایەت و ڕێنمانیی زیاد کردن ﴿وآتاهم تقواهم﴾ تەقواو پارێزکاریشی پێدان، تاخۆیانی پێبپارێزن لە ئاگر ﴿[١٨] فهل ینظرون إلا الساعة أن تأتیهم بغتة﴾ ئایا ئەمانە مەگەر چاوەڕێی هاتنی قیامەت ناکەن لەناکاو دەرگایان لێ بگرێت؟! ﴿فقد جاء أشراطها﴾ خۆ بێگومان هەندێ لە نیشانەکانی قیامەت هاتوونە پێش و دەرکەوتوون، وەك لەسوورەتێکا ئەفەرموێ: (إقتربت الساعة وانشق القمر)یان (أتی أمر الله فلا تستعجلوه) (١/١٦) وە هاتنی دواهەمین پێغەمبەریش ﷺ) هەر یەکێکە لەنیشانەکانی ڕۆژی قیامەت. وەك خۆی ئەفەرموێ: (بعثت انا والساعة کهاتین) فتح الباری: (٥٦٠/٨). ﴿فأنی لهم إذا جاءتهم ذکراهم﴾ جا ئەو کاتە کە قیامەتیان هات ئیتر ئیمان هێنان و باوەڕ کردنیان چ کەڵکێکی ئەبێ؟!.

**بزانە خواو پەرستراوی بەهەق،هەر (الله)یە:**

﴿[١٩] فاعلم أنه لا إله إلا الله﴾ جا ئەی موحەممەد! ﷺ ئەی ئینسان! بزانە کە بێگومان جگە لە(الله) هیچ پەرستراوێکی هەق نیە مافی پەرستنی ببێ، دەسا تۆش لەسەر ئەو بیروباوەڕە سابت بەو، هەرگیز نەگۆڕێیت ﴿واستغفر لذنبك وللمؤمنین والمؤمنات﴾ وە بۆ خۆت و ئیمانداران لە پیاوان و ژنان داوای لێبوردنی گوناهان بکە، بۆیە ئەویش هەموو جار ئەی فەرموو: اللهم اغفر لی واجعلنی..) یان (اللهم اغفر لی ماقدمت وما أخرت وما أسررت..) فتح الباری: (٤٧٣/١٣) ﴿والله یعلم متقلبکم و مثواکم﴾ وەخوا خۆی چاك دەزانێت ئێوە چۆن هەڵدەسوڕێن و، چۆن ئیسراحەت ئەکەن، وە بە ڕۆژوو بەشەو چی ئەکەن , واتە:هەموو ئەحواڵتان ئەزانێ وهیچی لێشاراوە نیە.

**موسڵمانی ڕاست و موسڵمانی دەغەز لە دڵ:**

﴿[٢٠] ویقول الذین آمنوا لولا نزلت سورة﴾ هەندێك لە وانەی بڕوایان هێنابوو، لەخۆشی جیهاد و خۆبەخت کردندا ئەیانوت: خۆزگە دەربارەی جیهاد سورەتێك لەلایەن خواوە دەنێرراو فەرمانی بەجیهاد دەدا ﴿فإذا أنزلت سورة محکمة وذکر فیها القتال﴾ کەچی کاتێ سوورەتەکە ئاشکراو بێ پێچ و پەنا دابەزێنرا و بەراشکاوی باسی جەنگی تێداکرا ﴿رأیت الذین فی قلوبهم مرض﴾ بینیت ئەوانەی کە لە دڵیاندا نەخۆشیی نیفاق هەبوو ﴿ینظرون إلیك نظر المغشی علیه من الموت﴾ هەر وەك کەسێك لە ترسی مردن بیهۆشی بەسەریا هاتبێ، سەیرت ئەکەن "چاویان ئەبڵەق بووەو نازانن چۆن خۆیان قوتار بکەن لە جیهاد ﴿فأولی لهم﴾ جاشایستە تر بوو پێیان ﴿[٢١] طاعة وقول معروف﴾ گوێڕایەڵی و وتەیەکی پەسەند بۆفەرمانەکانی خوا ﴿فإذا عزم الأمر﴾ خۆ هەر جاکاتێ کاریجیهاد و

جەنگ جددی بوو, رقیان لێبووەوە ﴿فلو صدقوا الله لكان خيرا لهم﴾ خۆ ئەگەر لەگەڵ خواداڕاستیان کردبا ,و
ڕۆیشتبان بۆ جیهاد, ئەوە چاکتر بوو بۆیان, لەو دانیشتن و پاڵدانەوەو قسەیەیان ﴿[22] فهل عسيتم إن توليتم أن
تفسدوا في الأرض﴾ جا ئەر ئێوە لەفەرمانی خوا لاریی بکەن و گوێ بە جیهاد نەدەن, ئایا سەرەنجامی هەر ئەوە
نابێت کە فەساد و گێرە شێوێنی و خوێن ڕشتن لەزەویدا بەرپا بکەن؟! ﴿وتقطعوا أرحامكم﴾ و هەرچی پەیوەندی
خزمایەتی هەیە بیبڕن و بەجێی نەهێنن!ئەوسا بگەڕێنەوە بۆکارەکانی پێشووی سەردەمی نەفامیتان, هەر کەسێك
شتێ لەدڵ بگرێ و بیشارێتەوە بەنیازی خەیانەتەوە, خوای گەورە نیشانەو بەرگی ئەوەی لەبەردەکا تا بناسرێت.

دەربارەی پەیوەندی خزمایەتی و مافی خزمانەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (من سره النسآءُ فی الأجل،
والزیـادةفی الـرزق فلیصـل رحمـه) پێشـەوا ئەحمـەد:
(٢٧٩/٥).واتـە:ئـەوی پێیخۆشە تەمەن درێژ و ڕزق و ڕۆزی
فـرە بێـت باسـەردانی خزمـانی خـۆی بکـات و لێیـان
بپرسـێتەوە. ﴿[23] اولئـك الـذین لعـنهم الله﴾ ئـا ئەوانـە
کەسانێکن کە خوا نەفرینی لێ کردوون و"لەرەحمەتی خۆی
بـێ بەشـی کـردوون" ﴿فأصـمهم واعمـی ابصـارهم﴾
ئینجاکەڕی کردوون وکوێرایی هێناوە بەسەر چاویاندا.

**بۆ لە قورئان ڕانامێنن؟:**

﴿[24] افلا یتدبرون القرآن﴾ ئایا ئەوانە بۆ لە ئایەتەکانی
قورئـان ڕانـامێنن و تێنـافکرێن, تـا پەنـدو ئامۆژگـاری لێ
وەرگرن؟ ﴿أم علی قلـوب اقفالها﴾ بەڵکو قوفڵ لەسەر دڵیان
دراوەو, هـیچ خێرێکـی تێناچـێ ,بۆیـە ئـاوا گـومڕاو
سەرگەردان بوون؟ ﴿[25] إن الذین ارتدوا علی أدبارهم من بعد
مـا تـبین لهـم الهـدی﴾ بێگومـان ئەوانـەی کـە لەئیسـلام
هەڵگەڕانەوە,پاش ئـەوەی کـە ڕێـی ئیمان و ڕووناکیان بۆ
دەرکـەوت ﴿الشـیطان سـول لهـم واملـی لهـم﴾ شـەیتان
کارەخراپـەکانی بـۆ ڕازاندبوونـەوەو,هیواکـانی بـۆ درێـژ
کردبوونەوە ﴿[26] ذلك بأنهم قالوا للذین کرهوا ما نزل الله﴾ ئەوەش بەو هۆیەوەبووە وتیان بەوانە ڕقیان لە قورئان
دەبووەوە: ﴿سنطیعکم فی بعض الأمر﴾ ئێمە لەهەندێ ئیش وکارا بە قسەتان ئەکەین ,وەك نەچوون بۆ جیهادو
لەماڵەوە دانیشتن ﴿والله یعلم إسرارهم﴾ خواش دەزانێت بە پەنهانکردنی ئەوقسەیەیان کردبوویان بۆ جوولەکەکان
,وەك لەسوورەتێکدا- سەبارەت بەزانینی نهێنیەکانیان, ئەفەرمووێ: (والله یکتب مایبتون) ﴿[27] فکیف إذا توفتهم
الملائکة یضربون وجوههم وادبارهم﴾ ئەوە حاڵیانە لە ژیانیاندا, ئاخۆ دەبێ حاڵیان چۆن بێت, کاتێ فریشتەکان
گیانیان دەکێشن وبەدەم و چاوو بەرو پشتیاندا دەدەن؟﴿[28] ذلك بأنهم اتبعوا ما اسخط الله وکرهوا رضوانه﴾ ئەو
تۆڵەیەشیان بەو جۆرە, بەهۆی ئەوەوەیە کە بەڕاستیی شوێنی شتێ کەوتن خوا تووڕە دەکات، وە لەوەش ڕقیان

الجزء السادس والعشرون — سورة محمد

وَيَقُولُ الَّذِينَ آمَنُوا لَوْلَا نُزِّلَتْ سُورَةٌ فَإِذَا أُنزِلَتْ سُورَةٌ
مُّحْكَمَةٌ وَذُكِرَ فِيهَا الْقِتَالُ رَأَيْتَ الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ
يَنظُرُونَ إِلَيْكَ نَظَرَ الْمَغْشِيِّ عَلَيْهِ مِنَ الْمَوْتِ فَأَوْلَىٰ لَهُمْ
(٢٠) طَاعَةٌ وَقَوْلٌ مَّعْرُوفٌ فَإِذَا عَزَمَ الْأَمْرُ فَلَوْ صَدَقُوا اللَّهَ
لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ (٢١) فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِن تَوَلَّيْتُمْ أَن تُفْسِدُوا
فِي الْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوا أَرْحَامَكُمْ (٢٢) أُولَٰئِكَ الَّذِينَ لَعَنَهُمُ اللَّهُ
فَأَصَمَّهُمْ وَأَعْمَىٰ أَبْصَارَهُمْ (٢٣) أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ
أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَا (٢٤) إِنَّ الَّذِينَ ارْتَدُّوا عَلَىٰ أَدْبَارِهِم
مِّن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْهُدَى الشَّيْطَانُ سَوَّلَ لَهُمْ وَأَمْلَىٰ
لَهُمْ (٢٥) ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا لِلَّذِينَ كَرِهُوا مَا نَزَّلَ
اللَّهُ سَنُطِيعُكُمْ فِي بَعْضِ الْأَمْرِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِسْرَارَهُمْ
(٢٦) فَكَيْفَ إِذَا تَوَفَّتْهُمُ الْمَلَائِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ
وَأَدْبَارَهُمْ (٢٧) ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ اتَّبَعُوا مَا أَسْخَطَ اللَّهَ
وَكَرِهُوا رِضْوَانَهُ فَأَحْبَطَ أَعْمَالَهُمْ (٢٨) أَمْ حَسِبَ
الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَن لَّن يُخْرِجَ اللَّهُ أَضْغَانَهُمْ (٢٩)

٥٠٩

دەبووەوەكە دوبوویە هۆی رەزامەندی و خۆشنوودی خوای گەورە ﴿فأحبط أعمالهم﴾ ئینجا خوایش كارو كردەوەكانیانی پووچەڵ كردەوە.

**خۆراك و كینەی غەرەزاوییەكان دەردەخات:**

﴿[٢٩] أم حسب الذین فی قلوبهم مرض أن لن یخرج الله أضغانهم﴾ بەڵكو دووڕوووەكان -كە نەخۆشیی نیفاق لەدڵیاندایە- پێیان وایە خوا رق وكینەی دەروونیان بۆ پێغەمبەرو ئیماندارەكان دەر ناخا و، لای بەندەكانی خۆی ئابڕوویان نابات؟! ﴿[٣٠] ولو نشاء لأریناكهم فلعرفتهم بسیماهم﴾ وەئەگەربمانەوێ ئەو دووڕووانەت نیشان دەدەین ،ئینجا تۆش بەسەرومیقنەیاندا دەتناسین،بەڵام وا ناكەین، هەتا لەریزەكانتاندا دوژمنایەتی پەیدا نەبێ ﴿ولتعرفنهم فی لحن القول﴾ خۆ بێگومان خۆیشت ئەی موحەممەد ﷺ! بەشێوازی قسەو گفتوگۆیاندا ئەیانناسیتەوە، چونكە كاتێ دێنە لات، سوێندێكی زۆر ئەخۆن و باوەڕداری خۆیان دەر ئەخەن، كەچی لەژێرەوە جۆرێكی ترن.

ئیمامی (دارە قوتنی) ئەم فەرموودەیەی هێناوە: (ما أسرَ أحد سریرةَ إلا كساه الله جلبابها، إن خیرا فخیر، وإن شرا فشر). پێشەوا عوسمانیش چەندە جوانی وتووە: (ما أسر احد سریرة إلا ابداها الله علی صفحات وجهه، و فلتات لسانه). ئەڵێ: پێغەمبەر ﷺ وتارێكی بۆ خوێندینەوە -پاش حەمدو ستایش بۆ خوا- فەرمووی: (إن منكم منافقین، فمن سمیت فلیقم) پاشان فەرمووی: (قم یا فلان، قم یا فلان، قم یا فلان، -حتی سمی ستة وثلاثین رجلا- ثم قال: إن فیكم -أو منكم- فاتقوا الله)مسند احمد: ٢٧٣/٥.﴿والله یعلم اعمالكم﴾ خوا خۆیشی ئاگاو زانایە بەكردەوەكانتان ,چونكە هیچ شتێك لای ئەو پەنهان و نادیار نیە ﴿[٣١] ولنبلونكم حتی نعلم المجاهدین منكم والصابرین﴾ و بەراستیی ئێمە بەجیهادو كاری قورس تاقیتان ئەكەینەوە "تا بزانین كامانەتان جیهادكارو خۆراگرن ، دەركەوێ كێ موجاهیدی راستەقینەیەو, لەسەر نارەحەتی و جیهادیش بەصەبرو بەئارامە ﴿ونبلو اخباركم﴾ هەواڵی كاروكردەوەی ئێوەمان بێتە دەستو تاقی بكەینەوەو بیخەینە روو "چاكە، یان خراپ. (ئیبراهیمی كوڕی ئەشعەس) ئەڵێ: كاتێ (فوزەیلی كوڕی عەیاض) ئەم ئایەتانەی ئەخوێندەوە، دەستی بەگریان دەكرد و ئەیوت: خوایا! تاقیمان نەكەیتەوە، چونكە لەتاقی كردنەوەدا ئابڕومان ئەچێت و، نهێنییەكانمان وە دەرئەكەوێ" ﴿[٣٢] إن الذین كفروا وصدوا عن سبیل الله﴾ بێگومان ئەو كەسانەی بێ بڕوان و رێ لەبڵاوكردنەوەی شەریعەت و بەرنامەی خوا دەگرن ﴿وشاقوا الرسول من بعد ماتبین لهم الهدی﴾ دژایەتی و سەرپێچی پەیامبەر دەكەن ,پاش ئەوە كەرێی راستیان بۆ روون بوویەوە ﴿لن یضروا الله شیئا وسیحبط أعمالهم﴾ ئا ئەوانە بەهیچ شێوەیەك ناتوانن زیانێ بە ئایینی خوا بگەیەنن، وە لەپاشە رۆژیشدا خوای گەورە هەموو

سُورَةُ مُحَمَّدٍ — الجزءُ السادسُ والعشرون

وَلَوْ نَشَآءُ لَأَرَيْنَـٰكَهُمْ فَلَعَرَفْتَهُم بِسِيمَـٰهُمْ ۚ وَلَتَعْرِفَنَّهُمْ فِى
لَحْنِ ٱلْقَوْلِ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ أَعْمَـٰلَكُمْ ﴿٣٠﴾ وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ حَتَّىٰ نَعْلَمَ
ٱلْمُجَـٰهِدِينَ مِنكُمْ وَٱلصَّـٰبِرِينَ وَنَبْلُوَا۟ أَخْبَارَكُمْ ﴿٣١﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ
كَفَرُوا۟ وَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَشَآقُّوا۟ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ
لَهُمُ ٱلْهُدَىٰ لَن يَضُرُّوا۟ ٱللَّهَ شَيْـًٔا وَسَيُحْبِطُ أَعْمَـٰلَهُمْ ﴿٣٢﴾
۞ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ وَلَا تُبْطِلُوٓا۟
أَعْمَـٰلَكُمْ ﴿٣٣﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ مَاتُوا۟
وَهُمْ كُفَّارٌ فَلَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ ﴿٣٤﴾ فَلَا تَهِنُوا۟ وَتَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱلسَّلْمِ
وَأَنتُمُ ٱلْأَعْلَوْنَ وَٱللَّهُ مَعَكُمْ وَلَن يَتِرَكُمْ أَعْمَـٰلَكُمْ ﴿٣٥﴾ إِنَّمَا
ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ ۚ وَإِن تُؤْمِنُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ يُؤْتِكُمْ أُجُورَكُمْ
وَلَا يَسْـَٔلْكُمْ أَمْوَٰلَكُمْ ﴿٣٦﴾ إِن يَسْـَٔلْكُمُوهَا فَيُحْفِكُمْ
تَبْخَلُوا۟ وَيُخْرِجْ أَضْغَـٰنَكُمْ ﴿٣٧﴾ هَـٰٓأَنتُمْ هَـٰٓؤُلَآءِ تُدْعَوْنَ
لِتُنفِقُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَمِنكُم مَّن يَبْخَلُ ۖ وَمَن يَبْخَلْ
فَإِنَّمَا يَبْخَلُ عَن نَّفْسِهِۦ ۚ وَٱللَّهُ ٱلْغَنِىُّ وَأَنتُمُ ٱلْفُقَرَآءُ ۚ وَإِن
تَتَوَلَّوْا۟ يَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُونُوٓا۟ أَمْثَـٰلَكُم ﴿٣٨﴾

سُورَةُ الفَتْح ٥١٠

کردەوەکانیان باتڵ و پووچەڵ ئەکاتەوە ﴿[٣٣] یا أیها الذین آمنوا أطیعوا الله وأطیعوا الرسول﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! لەفەرمانەکانی خواو پێغەمبەر گوێرایەڵی بکەن و ﴿ولاتبطلوا أعمالکم﴾ کارو کردارتان – بەڕووپامایی و شیرك وکوفر – پووچ مەکەنەوە ﴿[٣٤] إن الذین کفروا وصدوا عن سبیل الله﴾ بێگومان ئەو کەسانەی بێ بڕوابوون و بەرهەڵستی خەڵکیشیان دەکرد لەڕێبازی خوا ﴿ثم ماتوا وهم کفار﴾ پاشان هەر بەکافری و بێدینیش مردن ﴿فلن یغفر الله لهم﴾ جاهەرگیز خوا ئەوانە نابەخشێت, چونکە لەسەر کوفرو بێ بڕوایی مردوون.

**هەتا دەتوانن بۆ جیهاد سست مەبن و, داوای شەڕ وەستانیش مەکەن:**

﴿[٣٥] فلا تهنوا وتدعوا إلی السلم﴾ جا ئێوە هەرگیز سست و لاواز مەبن لە کوشتاری کافران، داوای سازش و ئاشتیان – پێشوەخت – لەگەڵ مەکەن لە ترساندا.بەڵێ سازش و رێکەوتن و پەیمان بەستن لەگەڵ خوا نەناس و بێ باوەڕاندا , ئەگەر لەبەر ناچاری و پێویستیی نەبێ, هەرگیز نابێ و رەوا نیە، بەڵام هەرکات موسڵمانان لاوازو بێ دەسەڵات بوون و لە بەرامبەر دوژمنیشدا نەیاتوانی بەرەنگاری بکەن ,ئەوە لەوحاڵەتانەدا رەوایە، تازیانی زۆرتروگەورەتر روو نەدات. وەك پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ قورەیشدا پەیمانی مۆر کرد وبۆ دەساڵیش جەنگی وەستان, کاتێ رێیان لێگرت بچێتە مەککەوە ﴿وانتم الاعلون﴾ لەکاتێکدا بەهێزی ئیمانەکەتان ئێوە زاڵترن, لەرووی بیروباوەڕو ئایدۆلۆژیاو بۆچوونەوە بۆ ژیان، لەرووی پەیڕەوو پرۆگرامەوە لەبارەی ئامانجەوە، لە رووی هەست و رەوشت و سلووکەوە ﴿والله معکم﴾ خواش لەگەڵتانە , ئێوە بەتەنها نین..بەڵکو خوایەکی دەسەڵاتداروخاوەنهێزتان لە گەڵدایە ﴿ولن یترکم أعمالکم﴾ و هەرگیزیش پاداشتی کارو کردەوەکانتان کەم و پووچەڵ ناکاتەوە، وەك هی بێ بڕوایان باتڵ ئەکاتەوە ﴿[٣٦] إنما الحیاة الدنیا لعب ولهو﴾ بەڕاستیی ژیانی ئەم دونیایە بریتیە هەر لە گەمەی منداڵان و,گاڵتەو گەپی مەشرەب چرووکان , لەوە بەولاوە شتی تر نییە، جا کەوابوو بەکۆمەڵ بەرەو جهیاد بڕۆن و لەپێناوی ئایینی خوادا جەنگ بکەن ﴿وإن تؤمنوا وتتقوا یؤتکم أجورکم﴾ ئەگەر بڕوا بێنن بە پەروەردگارتان و خۆ پارێزن لەسەر پێچی و شیرك، ئەوە خواش بەتێرو تەسەلی پاداشتتان پێ ئەبەخشێ, جا کەواتە بێ وچان هەوڵی جیهاد بدەن ﴿ولا یسألکم أموالکم﴾ و لەراستی ئەوە خوا داوای بەختکردنی هەموو دارایی و سامانتان لێ ناکات , بەڵکو جگە لەزەکات هەرچەندتان پێ ئەنجام بدرێ بەسە، لەوە بەدەر, نایەوێ تەنگەتاوتان ببن ﴿[٣٧] إن یسألکموها فیحفکم تبخلوا﴾ خۆئەگەر جار لەدوای جار داوای بەخشینی هەموو سامانتان لێ بکات، تەنگەتاو دەبن و ئەوکاتەش رژدو چرووك ئەبن و بەختی ناکەن ﴿ویخرج أضغانکم﴾ وە هەموو رك و قینەکانیشتان وە دەردێنێ و ئاشکرا دەبێ, واتە: بە رژدی و چرووکی دەردەکەوێ چەندە دەغەز لەدەڵن, بەڵام خوا وا ناکات ﴿[٣٨] ها أنتم أولاء تدعون لتنفقوا فی سبیل الله﴾ ئائەوە ئێوەن بانگ دەکرێن – ئەی موسڵمانان! بۆئەوەی ماڵ و سامانتان, لەرێی خوادا ببەخشن وبچنە جیهاد ﴿فمنکم من یبخل﴾ جاهی واتان چرووکی دەکاو ماڵی بەخت ناکات ﴿ومن یبخل فإنما یبخل عن نفسه﴾ هەرکەسێکیش رژدیءو چرووکی بکات, ئەوە هەر لە خۆی چرووکی دەکات, واتە: زیانەکەی بۆ خودی خۆی ئەگەڕێتەوە و بەرامبەر بەخۆی رژدی کردووە , چونکە وڵاتیی و، سامانیی و، شەرەفیی کاتێ کە دوژمنان داگیری بکەن و، ئەویش لە رەزیلی و چرووکی خۆیدا دەست نوقاو ئەبێ ﴿والله الغنی وأنتم الفقراء﴾ وەخواش دەوڵەمەندو ئێوەش هەژارو موحتاجن بەو , خوا ئەیەوێ ئێوە بەشان و شەوکەت بن, بۆیە ماڵ و سامانتان پێ بەخت ئەکات، نەك لەبەر ئەوە بێت سوود و کەڵکێ بەو بگات ﴿وإن تتولوا یستبدل قوما غیرکم﴾ خوا شەرەفی هەڵگرتنی ئەم پەیامەی بە ئێوە داوە، ئەبێ ئێوەش لە پێناویا جیهاد بکەن و سامانتان بەخت بکەن, خۆ ئەگەر لەم دینە پشت هەڵ

بکەن و ئامادە نەبن بۆ جیهاد و چرووك و پیسکە بن لەبەخشینی ماڵ لەڕێگەی جیهاددا، خوای گەورە ئێوە دەگۆڕێ بە قەوم و گەلێکی تر و,ئەوشەرەفەتان لێدەسێنێتەوە ﴿ثم لا یکونوا امثالکم﴾ ئەوسائەوانیش وەك ئێوە نابن. پێشەوا (موسلیم) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئەم ئایەتەی (وإن تتولوا..) خوێندەوە، پاشان هاوەڵانی وتیان: دەبێ ئەوانە چ کەسانێك بن – کەئەر ئێمە لا بدرێین– ئەوانە دەخرێنە جێی ئێمەوەو، وەك ئێمەش نابن؟ واتە: ئەوان لێبڕاوتر دەبن, دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەستی خستە سەر شانی (سەلمان)ی فارسیی و فەرمووی: ((هذا وقومه، ولو كان الدين عند الثريا، لناله رجال من الفرس)). ئەمە خۆی و هۆزەکەیەتی، چونکە ئەوەندە دینییان خۆش دەوێت ,ئەگەر لەلای ئەستێرەی کۆیشدابێ , دەستی پیاوانی ئەوانی دەگاتێ، و جیهاد ئەکەن، ماڵ و سامان بەخت ئەکەن، تێدەکۆشن، ململانێ لەگەڵ تاغووتاندا ئەکەن، سازشیان لەگەڵ ناکەن.

بەڵێ گەورەترین شەرەف و دەست مایە بۆ ئەم ئوممەتە, تەنیاو تەنیا قورئان و باوەڕ، سەرکەوتنی ئەوان و تێکشکانی دوژمنانی دینی خوایە، موسڵمانەکان چەندە هەوڵ بدەن و، تێبکۆشن, ئەوەندەش سەردارو سالاری جیهان ئەبن، هەر کاتێکیش تەمبەڵی و ڕژدیی وچرووکییان کرد و وازیان لە جیهاد هێنا, ئەوا خوایش نە یارمەتییان ئەدات، نە لەگەڵیشیان ئەبێ، وە نەهەر ئەوەندە، بەڵکو زەلیل و ریسواو ژێر دەستی گەلانیش ئەبن، وەك ئێستا موسڵمانان لەملیارێك زیاترن و، یەك لەسەر چواری دانیشتوانی گۆی زەوییان داگرتووە، لەولایشەوە لە بەرهەمهێنانی نەوت و, چەندین شتی تردا یەکەمی جیهانن، دەبینی لە گەڵ ئەوانەشدا هیچ جۆرە کیان و بوونێکیان نیە!هیچ گومانێکش لەوەدا نیە کە ئەوە باجی لادانیانە لەجیهاد، چونکە سوننەتی ئەم ئایینی خوا وایە هەردەبێ بەو جۆرەیە سەر بخرێت، کە دەستەی یەکەم وبۆ جاری یەکەم پێی سەرکەوتن.

کۆتایی تەفسیری سوورەتی (قیتال).

*** *** ***

## ٤٨- سوورەتی (فەتح)ـە

## مەدەنییەو (٢٩) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتەش وەك سوورەتە مەدەنییەکانی تر, باس لەگەڵ خاڵی گرنگ ئەکات, بۆنموونە: خواپەرستیی، ئەخلاق و رەوشت، پەیمانەکەی (حودەیبیە) کە لەساڵی شەشەمی کۆچیدا پەیامبەری سالارمان ﷺ لەگەڵ قورەیشدا مۆری کرد, لەئەنجامیشدا بووبەکلیلیکردنەوەی دەرگای فەتحی مەککە، لەوێوە فەتح دەستی پێکردو خواش موسڵمانەکانی سەر خست و,دوای ئەوە خەڵکی لە هەموو لایەکەوە پۆل پۆل موسڵمان دەبوون: (إنا فتحنا لك فتحا مبينا).

باسی جیهادی هاوەڵان و (بيعة الرضوان) دەکات کە: هاوەڵان پەیمانیان بە پەیامبەر ﷺدا کە تا مردن کۆڵ نەدەن و جیهاد بکەن.. لەراستیدا ئەو پەیمانە پەیمانێکی زۆر گرنگ و شەریف و پیرۆز بوو. هەر بۆیەش خوای گەورە فەرمووی: (لقد رضي الله عن المؤمنين إذ يبايعونك تحت الشجرة..)، هەروەها باسی ئەو دووڕووانە ئەکات کە لەجەنگەکاندا خۆیان دەدزیەوە لە جیهادو سەرپێچییان دەکرد لە فەرمانی پێغەمبەر, هەروەك باسی ئەو خەونەش ئەکات کە پەیامبەر ﷺ لە مەدینەدا دیتبووی, پاشان بۆ هاوەڵانی گێڕابوویەوەو ئەوانیش زۆر پێی دڵخۆش بوون..

کۆتاییشی بە وەسف و ستایشی پەیامبەر و هاوەڵانی دێ: (محمد رسول الله والذين معه أشداء على الكفار رحماء بينهم..).

﴿بسم الله الرحمن الرحيم * [١] إنا فتحنا لك فتحا مبينا﴾ بێگومان ئێمە - بەهۆی پێکهاتنەکەی حودەیبییەوە- فەتحێکی ئاشکرامان بۆ کردیت ئەی موحەممەد! ﷺ واتە: بەوفەتحە دەرگای سەرکەوتنمان لێکردیتەوەو، پاشان شاری مەککەمان بۆ فەتح کردیت و، حودەیبیە بووبە پێش قەرەوڵی ئەو فەتحە، جا کەوابوو هەر لەئێستاوە وەکو ئەوە وایە کە وڵاتەکەمان بۆ فەتح کردبێت. جەماوەری زانایان پێیان وایە کە ئەم (فەتحە) پێکهاتنەکەی حودەیبییەیە، چونکە لە دواییدا بوو بەهۆی فەتحی مەککە، بۆیە حودەیبیی یە لە پلەو پایەدا لەفەتحی مەکە کەمتر نییە، بەتایبەت لەو ماوەیەدا خەڵکی تێکەڵی یەکتر بوون، وە زۆرێکی زۆرینەیان لەماوەی سێ ساڵدا موسڵمان بوون.. ئەم سوورەتەیش وەك (ئیبن کەسیر) ئەڵێ: ئەو کاتە هات کە پەیامبەر ﷺ لەمانگی (ذوالقعدة)ی ساڵی شەشەمی کۆچی لەحودەیبیە گەڕایەوە، چونکە ئەوان نەیانهێشت بڕواتە (مسجد الحرام)ەوە.. (مەراغیی) دەڵێ: ئێمەش ئەمەمان هەڵبژارد. ﴿[٢] ليغفر لك الله ما تقدم من ذنبك وما تأخر﴾ تاخوا لەو شتانەی -کە سەبارەت بە پلەو پایەی بەرزی تۆ- وەك گوناە وانە، خۆش ببێت، چ گوناهی رابردوو، وە چ گوناحەکانی دوا رۆژو ئایندەت، واتە: ئەو فەتحەت بۆ ئەکەینە هۆی سڕینەوەی ئەو جۆرە شتانە کە وەك (حسنات الأبرار سيئات المقربين)ن ﴿ويتم نعمته عليك﴾ وە نیعمەت و بەهرەکانی خۆیت بۆ تەواو بکا ﴿ويهديك صراطا مستقيما﴾ و بتخاتە سەر ڕێگەیەکی ڕاست، ئەویش تەنیا ڕێگەکەی ئیسلامە و، دەرەنجامیش بگەیتە پلەوپایەی هەرە بەرزی بەهەشت ﴿[٣] وينصرك الله نصرا عزيزا﴾ وە تاخوا سەرکەوتن و پیرۆزییەکی تۆکمەو قایمت بدا بەسەر دوژمنانی ئیسلامدا، بە شێوەیەك کە شەوکەتی تیا بەدی بکرێت بۆ موسڵمانان.

الجزء السادس والعشرون — سورة الفتح

سورة الفتح — مدنية ٤٨ — آياتها ٢٩

بسم الله الرحمن الرحيم

إنا فتحنا لك فتحا مبينا ﴿١﴾ ليغفر لك الله ما تقدم من ذنبك
وما تأخر ويتم نعمته عليك ويهديك صراطا مستقيما ﴿٢﴾
وينصرك الله نصرا عزيزا ﴿٣﴾ هو الذي أنزل السكينة في قلوب
المؤمنين ليزدادوا إيمانا مع إيمانهم ولله جنود السماوات
والأرض وكان الله عليما حكيما ﴿٤﴾ ليدخل المؤمنين والمؤمنات
جنات تجري من تحتها الأنهار خالدين فيها ويكفر عنهم
سيئاتهم وكان ذلك عند الله فوزا عظيما ﴿٥﴾ ويعذب
المنافقين والمنافقات والمشركين والمشركات الظانين
بالله ظن السوء عليهم دائرة السوء وغضب الله عليهم
ولعنهم وأعد لهم جهنم وساءت مصيرا ﴿٦﴾ ولله جنود
السماوات والأرض وكان الله عزيزا حكيما ﴿٧﴾ إنا أرسلناك
شاهدا ومبشرا ونذيرا ﴿٨﴾ لتؤمنوا بالله ورسوله
وتعزروه وتوقروه وتسبحوه بكرة وأصيلا ﴿٩﴾

٥١١

**خوا بوو رۆژی ( حودەیبییە ) ئۆقرەو ئارامی خستە دڵی ئیماندارانەوە:**

﴿[٤] هو الذى انزل السكينة فى قلوب المؤمنين﴾ ئەو خوایەیە کە ئاسوودەیی و ئارامیی رۆحیی و، مەعنەویی دابەزاندەدڵی بڕوادارەکان، لەکاتی پەیمانەکەی حودەیبییەدا ﴿ليزدادوا إيمانا مع إيمانهم﴾ بۆ ئەوەی بڕوایان زیاد بکات لەگەڵ بڕواکەیاندا، تا تەنها پشت بەخوا ببەستن و دڵیان تەنها یادی ئەوی تیا بەدی بکرێ ﴿ولله جنود السموات والأرض﴾ وەبۆ خوایە لەشکرەکانی ئاسمانەکان و زەویی: لە جنۆکە و فریشتەو هەورە تریشقەو گەردەلوول و زەمین لەرزەو لافاوو تۆفان.. هتد، ئەگەر خوا خۆی بیەوێ قورەیش لەناو ببات تەنها یەك فریشتەیان بەسە، بەڵام جیهادی پێویست کرد، چونکە لە جیهاددا بەڵگەی جەرگ بڕ بەدی ئەکرێ بۆیان ﴿وكان الله عليما

﴿حكيما﴾ بەردەوام خوایش زانایە بەسەر تەواوی جمو جوڵەکانیاندا, کار جوانیشە لەبڕیارەکانیدا، ئەوەتا پەیمانەکەی حودەیبیە ئەگەرچی لەرواڵەتدا لەبەرژەوەندی موسڵمانەکاندا نەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا خوا کردی بەمایەی سەرکەوتن و، دڵی موسڵمانەکانی راگرت بەرامبەر بە پەیمانەکە، هەرچەندە خەریك بوو لەناوخۆیاندا تێك بچن، (عومەری کوڕی خەتتاب) ئەڵێ: (ألست نبي الله حقا؟.. ألسنا على الحق وعدونا على الباطل؟) ئەی پەیامبەری خوا! مەگەر تۆ پەیامبەری راستەقینەی خوا نیت؟! مەگەر ئێمە لەسەر راستیی و هەق نین و، دوژمنانمان لەسەر رێگەو رێبازێکی لارو پووچەڵ نین؟! ئەویش فەرمووی: بەڵێ ئێمە حەقین و ئەوان ناحەق. عومەر وتی: (فلم نعطى الدنية في ديننا إذن)؟ جا کەوابوو بۆچی ئێمە ئەو ریسوایی‌یە قبووڵ بکەین بەرامبەر بەئیسلامەکەمان؟ پەیامبەرﷺ فەرمووی: (إني رسول الله ولست أعصيه وهو ناصرني). بێگومان من پەیامبەری خوام و هیچ کاتێ نافەرمانی و سەرپێچی لەبڕیارەکانی ئەو ناکەم و, ئەویش سەرم دەخات ﴿٥ ليدخل المؤمنين و المؤمنات جنات تجري من تحتها الأنهار خالدين فيها﴾ تا بڕواداران لەپیاوان و لەئافرەتان بخاتە نێو چەندان باخ و باخاتی ئەو بەهەشتەوە، کە ئاو لە بنکی دارو کۆشکەکانیانەوە بەهاژە دێ و دەڕوا، وە بەهەتاهەتاییش تیایا ئەمێنـنەوە ﴿ويكفر عنهم سيئاتهم﴾ وە تا لە تاوانەکانیان چاوپۆشی بکات ﴿وكان ذلك عند الله فوزاً عظيما﴾ وە ئەوەش لای خوا دەسکەوت و سەرکەوتنێکی گەورەیە ﴿٦ ويعذب المنافقين والمنافقات والمشركين والمشركات﴾ وە بۆ ئەوەش سزای پیاوان و ژنانی دووڕوو و موشریك بدات لەدونیاو لەقیامەتدا، ئێشیان پێ بگەیەنێت ﴿الظانين بالله ظن السوء﴾ ئەوانەی کە گومانی خراپیان دەربارەی خوا دەبردوپێیان وابوو کە: خوا پەیامبەرەکەی خۆی سەر ناخات و موشریکان لەبەینیان دێنن ﴿عليهم دائرة السوء﴾ ئەوانە خراپیان بەسەردێت (دیارە ئەمە دوعای شەڕە لێیان) ﴿وغضب الله عليهم ولعنهم﴾ و تووڕەیە لێیان و، نەفرینی لێکردوون و لەسۆزی خۆی دووری خستوونەتەوە ﴿وأعد لهم جهنم﴾ ودۆزەخیشی بۆ ئامادە کردوون ﴿وساءت مصيرا﴾ وە دۆزەخیش چ جێگایەکی بەدە ﴿٧ ولله جنود السموات والأرض﴾ وەبۆ خوایە لەشکرەکانی ئاسمانەکان و زەویی,هەموو لەبەر دەستی دەسەڵاتی ئەودان ,گەڵێ جار بۆ لەبنهێنانی دوژمنان بەکاریان دێنێ ﴿وكان الله عزيزا حكيما﴾ بەردەوام خوایەکی دەسەڵاتداری بەحیکمەتە. ئەم فەتحە چوار شتی زۆر گرنگی بۆ پەیامبەر ﷺ تێدا بوو:

١- لێبوردن لە هەموو گوناهانی رابووردوو و ئایندەی (کە ئەمەش تایبەتمەندی ئەوە).

٢- دەرکەوتنی دەسەڵات و موجیزەی پەیامبەرێتی.

٣- هیدایەت و رێنموونی بۆ رێگەو رێبازی راست. (شەریعەت و بەرنامە)کەی خوا.

٤- عیززەت و تواناو دەسەڵات پەیدا کردن لە ناوچەکەدا.

**بڕوادارانیش بەچوار شت بەهرەمەند بوون:**

١- ئارامیی.

٢- زیادکردنی ئیمان باوەڕیان.

٣- موژدە بەچوونە بەهەشتەوە.

٤- سڕینەوەی گوناهەکانیان.

**بێ باوەڕانیش دووچاری چوار شت بوون:**

١- سزاو تۆڵە.

٢- نەفرین.

٣- تووڕەیی و خەشمی خوا.

٤- چوونە ناو دۆزەخەوە.

### سیفەتەکانی پێغەمبەر ﷺ:

﴿[٨] إنا أرسلناك شاهدا ومبشرا ونذيرا﴾ بێگومان ئێمە تۆمان ڕەوانە کردووە ئەی موحەممەد ﷺ بەشایەت و مۆردەدەر ترسێنەر, واتە: بە شایەت لە سەر ئوممەتەکەت لە قیامەتدا,بەموژدەر بەبەهەشت بۆئەوەی وەڵامت دەداتەوە,بە ترسێنەر بەدۆزەخ بۆ ئەوەی سەرپێچیت ئەکات ﴿[٩] لتؤمنوا بالله ورسله﴾ تا ئێوە بەخواو بەپەیامبەرانی باوەڕ بێنن ﴿وتعزروه﴾ کۆمەکی بکەن, واتە: کۆمەکی لە ئاییەنەکەی بکەن ﴿وتوقروه﴾ و بە مەزنی بگرن , واتە:بەرێزداری دابنێن ﴿وتسبحوه بكرة واصيلا﴾ وە بە بەیانیان و ئێواران تەسبیحات و یادی بکەن و بەپاك و خاوێنی رایبگرن ﴿[١٠] إن الذين يبايعونك إنما يبايعون الله﴾ بێگومان ئەو کەسانەی بەتۆ بەیعەت و پەیمان ئەدەن کە پشتت بگرن و جیهاد بکەن, ئەوە لەراستییدا پەیمانیان لەگەڵ خوا بەستووە. مەبەست بەم پەیمانەش، (بيعة الرضوان) بوو کە لە حودەیبییەدا لەبن داری (سمره)دا ئەنجام دراوە، ژمارەی هاوەڵان لەو رۆژەدا دەگەیشتە (١٣٠٠) تا (١٤٠٠) کەس وەك (ئیبن کەسیر) ئەڵێ: (كنا يومئذ ألفاً أربعمائة، ووضع يده في ذلك الماء، فنبع الماء من بين أصابعه، حتى رووا كلهم). واتە: لەو رۆژەدا ئێمە (١٤٠٠) کەسێك دەبووین، وە پێغەمبەر ﷺ دەستی خستە نێو ئەو ئاوەوە، ئەوجا لەنێوان پەنجەکانیا ئاو هەڵقوڵی و ئەو خەڵکە هەموو تێراو بوون، لەڕیوایەتێکی دیکەدا هاتووە: (انهم كانوا خمس عشرة مائة)متفق عليه. واتە (١٥٠٠) کەسێك بوون. فتح الباری: ٤٥١/٨. موسلیم: ١٤٨٤/٣. ﴿يد الله فوق ايديهم﴾ دەستی خوا لەبان دەستیانەوەیە , ئەمە بەڵگەیە لەسەر پشتگیری خوا بۆیان, وەك دەستیان بەدەست ئەوەوە دابێت. ئەوە راو بۆچوونی (ئیبن کەسیر) و (ئیبن سەعدی / تيسير الكريم الرحمن)ە, بەڵام (ئالووسی) دەڵێت: (والسلف: يمرون الآية كما جاءت مع تنزيه الله -عز وجل- عن الجوارح وصفات الأجسام وكذلك يفعلون في جميع المتشابهات، ويقولون: إن معرفة حقيقة ذلك فرع معرفة حقيقة الذات وأنى ذلك, وهيهات هيات؟. ﴿فمن نكث فإنما ينكث على نفسه﴾ جا هەر کەسێك پەیمانشکێنی بکا و لێی پاشگەز ببێتەوە، ئەوە زیانی ئەوپەیمان شکێنیە تەنیا لەسەر خۆی دەکەوێ, چونکە خوای گەورە بێ نیازە لەو﴿ومن أوفى بما عاهد عليه الله﴾ جا هەرکەسیش پەیمانەکەی خوا بەرێتە سەرو وەفای پێ بکات ﴿فسيؤته اجرا عظيما﴾ جاخوای باڵادەستیش پاداشتێکی گەورەی پێدەدا.

الجُزْءُ السَّادِسُ وَالعِشْرُونَ — سُورَةُ الفَتْحِ

إِنَّ ٱلَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ ٱللَّهَ يَدُ ٱللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ فَمَن نَّكَثَ فَإِنَّمَا يَنكُثُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ وَمَنْ أَوْفَىٰ بِمَا عَٰهَدَ عَلَيْهُ ٱللَّهَ فَسَيُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١٠﴾ سَيَقُولُ لَكَ ٱلْمُخَلَّفُونَ مِنَ ٱلْأَعْرَابِ شَغَلَتْنَآ أَمْوَٰلُنَا وَأَهْلُونَا فَٱسْتَغْفِرْ لَنَا يَقُولُونَ بِأَلْسِنَتِهِم مَّا لَيْسَ فِى قُلُوبِهِمْ قُلْ فَمَن يَمْلِكُ لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا إِنْ أَرَادَ بِكُمْ ضَرًّا أَوْ أَرَادَ بِكُمْ نَفْعًۢا بَلْ كَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًۢا ﴿١١﴾ بَلْ ظَنَنتُمْ أَن لَّن يَنقَلِبَ ٱلرَّسُولُ وَٱلْمُؤْمِنُونَ إِلَىٰٓ أَهْلِيهِمْ أَبَدًا وَزُيِّنَ ذَٰلِكَ فِى قُلُوبِكُمْ وَظَنَنتُمْ ظَنَّ ٱلسَّوْءِ وَكُنتُمْ قَوْمًۢا بُورًا ﴿١٢﴾ وَمَن لَّمْ يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ فَإِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ سَعِيرًا ﴿١٣﴾ وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٤﴾ سَيَقُولُ ٱلْمُخَلَّفُونَ إِذَا ٱنطَلَقْتُمْ إِلَىٰ مَغَانِمَ لِتَأْخُذُوهَا ذَرُونَا نَتَّبِعْكُمْ يُرِيدُونَ أَن يُبَدِّلُوا۟ كَلَٰمَ ٱللَّهِ قُل لَّن تَتَّبِعُونَا كَذَٰلِكُمْ قَالَ ٱللَّهُ مِن قَبْلُ فَسَيَقُولُونَ بَلْ تَحْسُدُونَنَا بَلْ كَانُوا۟ لَا يَفْقَهُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٥﴾

٥١٢ قُلْ لِلْمُخَلَّفِينَ

## برو بیانووهێنانەوەی بەجێماوەکانی ( حودەیبیە ) بۆ پێغەمبەر ﷺ:

﴿ ١١ سيقول لك المخلفون من الأعرب﴾ جا کە لەحودەیبیە گەڕایتەوە, بێگومان عەرەبە دەشتەکیەکان (ئەوانەی
واپاشەکشێیان کردوو لەگەڵتان نەهاتن بۆزیارەتی کەعبە پاش ئەوەی تۆ داوات لێکــردن) پێت ئەڵێن: ﴿شغلتنا
أموالنا وأهلونا فاستغفر لنا﴾ پاراستنی ماڵ و ژن ومنداڵمان, ئێمەی بە خۆیەوە سەرگەرمکرد, لە دەرچوون لە گەڵت
,جالای خوا داوای لێبوردنمان بۆ بکەیت ﴿يقولون بألسنتهم ما ليس في قلوبهم﴾ شتێ بە زمانیان دەڵێن, غەیری
ئەوەیە لە دڵیاندایە, واتە: لە قسەکانیاندا راست ناکەن و,ئەیانەوێ فرت و فێڵت لێ بکەن ﴿قل فمن يملك لكم من الله
شيئا﴾ پێیان بڵێ: ئایا چ کەسێك شتێکی بەدەستە لە خواوە بۆتان ﴿إن أراد بكم ضرا أو أراد بكم نفعا﴾ ئەگەر خوا
ویستی زیانێکیپێتان بوو, یان ویستی سودێکتان پێ بگات ﴿بل كان الله بما تعملون خبيرا﴾ بەڵکو خوا بەکارو
کردەوەکانتان بە ئاگایە, ئەو دەزانێت هۆی راستەقینە چیبوو لەدوا کەوتنەکەتاندا؟ ﴿ ١٢ بل ظننتم أن لن ينقلب
الرسول والمؤمنون إلى أهليهم أبدا﴾ بەڵکو راستیەکەی ئەمەیە کە پێتان وابوو ئیتر هەرگیز پەیامبەرو بڕواداران
جارێکی تر ناگەڕێنەوە نێو خێزانەکانیان لە مەدینە، واتە: وا گومانتان دەبردکە قورەیش پێغەمبەرو ئیماندارەکان
لە ریشە دێنێ!! ﴿وزين ذلك في قلوبكم﴾ ئەو گومانبردنە لەدڵتاندا لە لایەن شەیتانەوە رازێنرابووەوە ﴿وظننتم ظن
السوء﴾ گومانتان برد, گومانی نادروست ,پێتان وابوو ئەوانە هیچ کەسێکیان ناگەڕێنە دواوە, بۆیە گوێتان نەدانێ
و لەگەڵیان نەچوون ﴿وكنتم قوما بورا﴾ وەئێوە لە زانینی خوادا قەومێکی تیاچوون ﴿ ١٣ ومن لم يؤمن بالله ورسوله﴾
و هەرکەسیش باوەڕی بەخواو بە پەیامبەری ئەو نەبێت,کافرو بێباوەڕە ﴿فإنا أعتدنا للكافرين سعيرا﴾
جابەڕاستیی ئێمە بۆ کافرو بێ بڕوایان ئاگرێکی هەڵگیرساوو سوتێنەرمان ئامادە کردووە ﴿ ١٤ ولله ملك السموات
والأرض﴾ هەموو دسەڵاتێکی ئاسمانەکان و زەوی تەنها هی خوایە ﴿يغفر لمن يشاء ويعذب من يشاء﴾ هەرکەسێك
کەخۆی بیەوێ و بەشیاوی بزانێت لێی خۆش ئەبێت، وەبیەوێ سزای هەرکەسیش بدات ئەیدات ﴿وكان الله غفورا
رحيما﴾ وەخواش,هەر خوایەکی لێبوردەی بەبەزەییە، کەوابوو هەر ئێستا پەشیمان ببنەوەو تەوبە بکەن و گوێ
رایەڵیی پەیامبەربن، چونکە خوا خۆش ئەبێ لەوانەی پەشیمان ئەبنەوە ﴿ ١٥ سيقول المخلفون إذا انطلقتم إلى مغانم
لتأخذوها﴾ ئەوانەی کە لەپێغەمبەر ﷺ دواکەوتن ودەرنەچوون لە گەڵی بۆ حودەیبیە,کاتێ ئێوە بەڕێکەوتن بۆ
دەستکەوتەکان لە خەیبەر دەڵێن: ﴿ذرونا نتبعكم﴾ وازمان لێ بێنن, ئێمەیش لەگەڵتان بێین بۆ خەیبەر ﴿يريدون أن
يبدلوا كلام الله﴾ دەیانەوێت کە فەرمایشتی خوا بگۆڕن , واتە: بە بەشدار بوونیان لە غەنیمەت ودەسکەوتەکانی
خەیبەر,چونکە خوا- جل جلالە- بەڵێنی دابوو بە ئەهلی حودەیبیە کەدەسکەوتەکانی خەیبەر, هەر بۆئەهلی
حودەیبیە دەبێ نەك کەسانیتر. ﴿قل لن تتبعونا﴾ پێیان بڵێ: نابێهەرگیز لە شوێنمان بێن ﴿كذلكم قال الله من
قبل﴾ خوا پێش گەڕانەوە لەحودەیبیە وایفەرمووە کەنابێ هیچ کەستان بەشدار بێت لەو دەستکەوتانەدا
حودەیبیەدا﴿فسيقولون بل تحسدوننا بل كانوا لايفقهون إلا قليلا﴾ کەچی ئەوانە دەڵێن: ئەمەبەڵێنی خوا نییە،
بەڵکو ئێوە هەر بەخیلیی و حەسوودیمان پێ دەبەن، نەخێر، وانیە، بەڵکو ئەوانە کەم تێدەگەن.

## جیهاد سەنگی مەحەکە لەنێوان موسڵمان و دووڕوودا:

﴿ ١٦ قل للمخلفين من الأعراب ستدعون إلى قوم أولي بأس شديد﴾ ئەی موحەمەد!ﷺ بڵێ: بەعەرەبە
دەشتەکیەکان- ئەوانەیان دواکەوتن و لەجیهاد خۆیان دزییەوە- ئێوە لەئاییندەدا بانگ ئەکرێن بۆ جەنگ لەگەڵ
گەلێکی بە زەبرو بەهەڵمەت و جەنگاوەر, جا لەوێ خۆتان تاقی بکەنەوە ﴿تقاتلونهم أو يسلمون﴾ ئەوسا جەنگیان

لەگەڵ دەکەن، یان خۆیان بەبێ جەنگ موسڵمان ئەبن ﴿فإن تطيعوا يؤتكم الله أجرا حسنا﴾ ئینجا ئەگەر ئێوە فەرمانبەردار بن و ئامادەی جەنگ و جیهاد بن ئەوا خوا پاداشتێکی باشتان پێدەدا ﴿وإن تتولوا كما توليتم من قبل﴾ خۆ ئەگەر ئێوە وەکو لەمەپێش لە(حودەیبیە)دا پشتان هەڵکرد ﴿يعذبكم عذابا أليما﴾ ئەوا خوایش سزایەکی پڕ ئێشتان ئەدا.

ڕاڤەکەرانی قورئان کێشەیانە: ئایا ئەو کۆمەڵە زۆر بەهێزو بە هەڵمەتە کێ بن؟ قسە بۆ هۆزی (هەوازن) و (سەقیف) و (بەنی حەنیفە) و (فارس)ەکان و، ڕۆمەکان کراوە. (تەفسیری ئالووسیی) لە (ئەبوو هەرەیرە)وە ئەڵێ: (هم البارزون). واتە: ئەو کۆمەڵە بەهەڵمەت و قارەمانە (کوردەکانن).. (ئیبن جەریری تەبەریی)ش ئەڵێ: باشترین قسە لەم جێگایەدا ئەمەیە کە بڵێین: لەبەر ئەوەی کە خوای گەورە لە قورئاندا ئەو قەومەی دیاری نەکردووە چ قەومێکن، بۆ ئێمەش دیاری نەکردنیان چاکترە, چونکە دەگونجێ هەرئەوانە بن، دەشگونجێ خەڵکانێك بن لەئاییندەدا پەیدا ببن.

(ئیبن کەسیر) هەر لەم شوێنەدا ئەم فەرموودەیە –کە ئیمامی (بوخاریی و موسلیم) لە ئەبو هورەیرەوە گێڕاویانەتەوە – هێناوە:

١– (لا تقوم الساعة حتى تقاتلوا قوما صغار الاعين، لف الآنف، كأن وجوههم المجان المطرقة).

واتە: (قیامەت بەرپا نابێ تا ئێوە (ئەی ئیمانداران) جەنگ دەکەن لەگەڵ هۆزێکی چاو بچووکی، لووت کورتیی (یا لووت کورت و لووت پاندا) و دەموو چاویان دەڵێی (ترس) و مەتەڵەیە. واتە: دەموو چاوی تورکەکان لەپانی و ڕەنگدا لە (مەتەڵ) دەچی.

٢– (تقاتلون قوما نعالهم الشعر). واتە: لەگەڵ هۆزێکا دەجەنگێن کە پێڵاوو نەعلەکانیان لەمووە. فتح الباری: ١٠٤/٦. موسلیم: ٢٢٣٣/٤.

الجزء السادس والعشرون — سورة الفتح

قُل لِّلْمُخَلَّفِينَ مِنَ الْأَعْرَابِ سَتُدْعَوْنَ إِلَىٰ قَوْمٍ أُولِي بَأْسٍ شَدِيدٍ
تُقَاتِلُونَهُمْ أَوْ يُسْلِمُونَ ۖ فَإِن تُطِيعُوا يُؤْتِكُمُ اللَّهُ أَجْرًا حَسَنًا ۖ
وَإِن تَتَوَلَّوْا كَمَا تَوَلَّيْتُم مِّن قَبْلُ يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٦﴾ لَّيْسَ
عَلَى الْأَعْمَىٰ حَرَجٌ وَلَا عَلَى الْأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلَا عَلَى الْمَرِيضِ حَرَجٌ ۗ
وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ يُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ ۖ
وَمَن يَتَوَلَّ يُعَذِّبْهُ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٧﴾ ۞ لَّقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ
الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ
فَأَنزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَابَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿١٨﴾ وَمَغَانِمَ
كَثِيرَةً يَأْخُذُونَهَا ۗ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٩﴾ وَعَدَكُمُ اللَّهُ
مَغَانِمَ كَثِيرَةً تَأْخُذُونَهَا فَعَجَّلَ لَكُمْ هَٰذِهِ وَكَفَّ أَيْدِيَ
النَّاسِ عَنكُمْ وَلِتَكُونَ آيَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ وَيَهْدِيَكُمْ صِرَاطًا
مُّسْتَقِيمًا ﴿٢٠﴾ وَأُخْرَىٰ لَمْ تَقْدِرُوا عَلَيْهَا قَدْ أَحَاطَ اللَّهُ بِهَا ۚ
وَكَانَ اللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرًا ﴿٢١﴾ وَلَوْ قَاتَلَكُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا
لَوَلَّوُا الْأَدْبَارَ ثُمَّ لَا يَجِدُونَ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿٢٢﴾ سُنَّةَ
اللَّهِ الَّتِي قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلُ ۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَبْدِيلًا ﴿٢٣﴾

الحزب ٥٢

٥١٣

**ئەمانە جیهادیان لەسەر نییە:**

﴿[١٧] ليس على الأعمى حرج ولا على الأعرج حرج ولا على المريض حرج﴾ نابیناو شەل و نەخۆش، هیچ ئەرەج و گوناهێکیان لەسەر نییە لە نەچوون بۆ جیهاد... بەڵام ئێوەی لەش ساغ نابێ دوابکەون ﴿ومن يطع الله ورسوله يدخله جنات تجري من تحتها الأنهار﴾ وە هەر کەسێك گوێڕایەڵی لە خواو لەپەیامبەرەکەی بکات، خوا ئەیباتە نێو چەندین باخە وە بەبن درەخت و کۆشکەکانیدا ڕووباری زۆر دێت و دەچێت ﴿ومن يتول يعذبه عذابا أليما﴾ ئەوکەسەش پشت هەڵ بکات لە گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی، ئەوا خوا سزایەکی ئێش پێگەیەنەری ئەدات.

**رازيبوونی خوا له ئه‌هلی حوده‌يبيه :**

﴿[١٨] لقد رضى الله عن المؤمنين إذ يبايعونك تحت الشجرة﴾ بێگومان خوا رازيبوو له ئيمانداره‌كان كاتێ –له‌ژێر ئه‌ودره‌خته دا پێی ده‌ڵێن: (شجرة الرضوان)– په‌يمانيان له‌گه‌ڵ ده‌به‌ستيت ئه‌ی موحه‌ممه‌د ﷺ ﴿فعلم ما في قلوبهم﴾ جا خوا به‌و راستيی و وفايه‌ی له‌دڵياندا بوو بۆ په‌يمانه‌كه‌ت ئاگاداربوو ﴿فأنزل السكينة عليهم﴾ ئينجا له‌كاتی په‌يمانه‌كه‌دا ئارامیی دابه‌زانده سه‌ريان ﴿وأثابهم فتحا قريبا﴾ و به سه‌ركه‌وتنێكی نزيك – فه‌تحی خه‌يبه‌ر– له‌سه‌ر (بيعة الرضوان) پاداشتی دانه‌وه. هۆی په‌يمانی (بيعة الرضوان) ئه‌وه‌بوو كه‌په‌يامبه‌ر كاتێ گه‌يشته حوده‌يبيه، (عوسمانی كوڕی عه‌ففان)ی نارد بۆلای مه‌ككه‌ييه‌كان تا پێيان بڵێ: كه پێغه‌مبه‌ر ﷺ به‌نيازی عومره‌وه هاتووه، نه‌ك به‌نيازی جه‌نگه‌وه، جا كاتێ عوسمان گه‌يشته لايان زيندانيان كردو، پاشان هه‌واڵی كوژرانيشی گه‌يشته‌وه لای پێغه‌مبه‌رو موسڵمانه‌كان, ئينجا په‌يامبه‌ر موسڵمانه‌كانی كۆكرده‌وه‌و په‌يمانی لێوه‌رگرتن: كه ئه‌گه‌ر ئه‌وهه‌واڵه راست بێت ئه‌بێ به‌جه‌نگ و به‌زۆر بڕۆنه مه‌ككه‌وه، ئه‌وانيش په‌يمانياندا تا مردن، جا كاتێ هه‌واڵ گه‌يشته‌وه قوره‌يش له‌رزيان لێ نيشت و له‌ترسانا عوسمانيان ئازاد كرد. ﴿[١٩] ومغانم كثيرة يأخذونها﴾ جگه له‌وه‌يش , به‌ده‌ستكه‌وتێكی زۆريش به‌ڵێنی پێدان ئه‌ی ئاماده‌بووانی حوده‌يبيه , واته: به‌ده‌سكه‌وتێكی زۆريش پاداشتی دانه‌وه, ئه‌ويش عه‌قارو زه‌وی وزاری خه‌يبه‌ربوو﴿وكان الله عزيزا حكيما﴾ خوا هه‌ميشه خوايه‌كی به‌ده‌سته‌ڵاتی به‌حيكمه‌ته.﴿[٢٠] وعدكم الله مغانم كثيرة تأخذونها﴾ خوا به‌ڵێنی به چه‌ند ده‌سكه‌وتێكی زۆر دانێ جگه له‌خه‌يبه‌ر، واته: موسڵمانان تارۆژی دوايی ده‌ستكه‌وتيان هه‌رئه‌بێ و ناوچه ئيسلامييه‌كانيش ساڵ له‌دوای ساڵ زيادئه‌بن ﴿فعجل لكم هذه﴾ جا به‌زوويی ئه‌مه‌يانی ده‌ستخستن, واته: غه‌نيمه‌ته‌كه‌ی خه‌يبه‌ر. ﴿وكف أيدى الناس عنكم﴾ رێی له خه‌ڵكانی ده‌ست درێژكه‌رانيشی لێگرتن, نه‌يهێشت جووله‌كه‌و هاوپه‌يمانه‌كانيان – له به‌نی ئه‌سه‌دو غه‌طه فان– زاڵ ببن به‌سه‌رتاندا ﴿ولتكون آية للمؤمنين﴾ وه‌بۆ ئه‌وه‌ی ده‌ستكه‌وته‌كه ببێ به‌نيشانه‌يه‌ك له راستی به‌ديهێنانی به‌ڵێنی خوا بۆ بڕواداره‌كان ﴿ويهديكم صراط مستقيما﴾ هه‌روه‌ها رێنمايشتان بكات بۆ رێگه‌يه‌كی راست و بتانگه‌يه‌نێته به‌هه‌شت ﴿[٢١] واخرى لم تقدروا عليها﴾ وه هی تر كه‌ئێوه تواناتان نه‌بوو به‌سه‌ريدا, واته: وه ده‌ست گه‌لێكی ديكه‌ش. (ئيبن جه‌رير) ئه‌ڵێ: مه‌به‌ست ئازادبوونی مه‌ككه‌يه ﴿قد أحاط الله بها﴾ كه‌خوا به‌زانينی خۆی ده‌وری لێدابووو ده‌يزانی ئه‌و ده‌ستكه‌وتانه بۆ ئێوه ده‌بن ﴿وكان الله على كل شئ قديرا﴾ چونكه خوا هه‌ميشه ده‌سه‌ڵاتی به‌سه‌ر هه‌موو شتێكدا هه‌يه ﴿[٢٢] ولو قاتلكم الذين كفروا﴾ ئه‌گه‌ر بێ باوه‌ڕه‌كانی مه‌ككه جه‌نگيان له‌گه‌ڵتان كردبا له‌حوده‌يبييه‌دا, واته: په‌يمانه‌كه نه‌بووبا، مه‌ككه‌ييه‌كان شه‌ڕيان پێ فرۆشتبان ﴿لولوا الأدبار﴾ پاشه‌و پاش هه‌ڵده‌هاتن و له‌به‌رده‌ستاندا ئه‌شكان ﴿ثم لايجدون وليا ولا نصيرا﴾ پاشان هيچ پشتيوان و يارمه‌تيده‌رێكيشيان ده‌ست نه‌ئه‌كه‌وت له‌كافره‌كانی ديكه‌دا ﴿[٢٣] سنة الله التى قد خلت من قبل﴾ سه‌رخستنی باوه‌ڕداران له هه‌موو سه‌رده‌مێكدا, له‌گه‌لانی پێشوودا كه‌رابوورد باوی خوا بووه ﴿ولن تجد لسنة الله تبديلا﴾ هه‌رگيز نابينی باوی خوا گۆڕانی به‌سه‌ردا بێت , واته:هه‌ركات موسڵمانه‌كان يارمه‌تی دينی خوايان دابێت، خوايش يارمه‌تيداون ﴿[٢٤] وهو الذى كف أيدهم عنكم وأيديكم عنهم ببطن مكة﴾ هه‌ر ئه‌و زاته بوو كه ده‌ستی ئه‌وانی (قوره‌يش) له ئێوه گرتوو نه‌يهێشت بێن به‌گژتاندا،وه ده‌ستی ئێوه‌شی له‌وان گرته‌وه,ده‌ره‌نجام وێڕای سه‌ركه‌وتنی ئێوه له‌نێوجه‌رگه‌ی شاری مه‌ككه‌دا, له حوده‌يبيه‌شدا نه‌يهێشت زيان به‌يه‌كتر بگه‌يه‌نن ﴿من بعد أن أظفركم عليهم﴾ پاش ئه‌وه كه ئێوه‌ی – له‌رۆژی فه‌تحی مه‌ككه‌دا– سه‌ر خست به‌سه‌رياندا وهه‌ندێكيانتان لێ‌ديل كردن، ئه‌وه بوو (٨٠) كه‌سيان خه‌ريكی

جاسووسی بوون به سەر موسڵمانەکانەوە پاشان دیلکران و، بردنیان بۆلای پەیامبەر، ئەویش لێیان خۆش بوو و ئازادی کردن، دەرەنجام ئەو کارە بووبەهۆی ڕێکەوتنیان.

(عەبدوڵڵای کوڕی مەغفەل) دەڵێت: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ لەژێر ئەو درەختەدا بووین کە خوا باسی کردووە لەقورئاندا چاك لەبیرمە کە (لق و گەڵای دارەکە شۆڕ بووبوویەوەو دەکەوتە سەر شانی پەیامبەر، (عەلی کوڕی ئەبی تالیب) و (عەمری کوڕی سوهەیل)یش لەوێ بوون، پاشان پەیامبەر بە عەلی فەرموو بنووسە: (بسم الله الرحمن الرحیم)، (سوهەیل) دەستی گرت و وتی ئێمە ئەمە نازانین و نەمانبیستووە، بنووسە: (بسمك اللهم)، ئەویش ئەوەی نووسیی و، پاشان نووسیشی (هذا ما صالح علیه رسول الله..). ئەمە ئەو ڕێکەوتننامەیە کە پەیامبەری خوا لەگەڵ مەککەیی‌یەکاندا، لەسەری ڕێك کەوتن، دووبارە (سوهەیل)وتی: مەنووسە پەیامبەری خوا! بنووسە (موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا..) ئا لەم کاتەدا موسڵمانەکان (٣٠) لاویان لەقورەیش دیلکرد، پاشان پەیامبەر ئازادیکردن، خوایش فەرمووی: (وهو الذی..) (ئیبن کەسیر) لەئیمامی (ئەحمەد)ەوە هێناویەتی. ﴿وكان الله بما تعملون بصيرا﴾ خواش هەمیشە بەکارو کردەوەتان بینایە.

**لەبەر موسڵمانانی ناو (مەککە) بوو، ڕێمان نەدا بە جەنگ بێن لەگەڵ موشریکەکاندا:**

﴿٢٥ هم الذين كفروا وصدوكم عن المسجد الحرام﴾ خەڵکی مەککە هەرئەوانەن کەبڕوایان نەهێناو، ئێوەشیان لەزیارەتی مزگەوتی حەرام قەدەغە کردوو گێڕایەوە لە ساڵی حودەیبییەدا ﴿والهدى معكوفا ان يبلغ محله﴾ و نەیان هێشت ئەو قوربانی(هەدی)یەی کە (٧٠) وشتر بوو و هێنابووتان بۆ کەعبە بگاتە جێی خۆی (مینا) بۆسەر بڕین ﴿ولولا رجال مؤمنون ونساء مؤمنات لم تعلموهم﴾ ئەگەر لەبەر ئەو پیاوو ژنە بڕوادارانە نەبوایە، کە ئێوە

الجزء السادس والعشرون — سُورَةُ الفَتْح

وَهُوَ ٱلَّذِي كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُم بِبَطْنِ مَكَّةَ مِنۢ
بَعْدِ أَنْ أَظْفَرَكُمْ عَلَيْهِمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا ﴿٢٤﴾ هُمُ
ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَصَدُّوكُمْ عَنِ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَٱلْهَدْىَ
مَعْكُوفًا أَن يَبْلُغَ مَحِلَّهُۥ ۚ وَلَوْلَا رِجَالٌ مُّؤْمِنُونَ وَنِسَآءٌ مُّؤْمِنَٰتٌ
لَّمْ تَعْلَمُوهُمْ أَن تَطَـُٔوهُمْ فَتُصِيبَكُم مِّنْهُم مَّعَرَّةٌۢ بِغَيْرِ عِلْمٍ ۖ
لِّيُدْخِلَ ٱللَّهُ فِى رَحْمَتِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ لَوْ تَزَيَّلُوا۟ لَعَذَّبْنَا ٱلَّذِينَ
كَفَرُوا۟ مِنْهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿٢٥﴾ إِذْ جَعَلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟
فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْحَمِيَّةَ حَمِيَّةَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ
عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَأَلْزَمَهُمْ كَلِمَةَ ٱلتَّقْوَىٰ
وَكَانُوٓا۟ أَحَقَّ بِهَا وَأَهْلَهَا ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴿٢٦﴾
لَّقَدْ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءْيَا بِٱلْحَقِّ ۖ لَتَدْخُلُنَّ ٱلْمَسْجِدَ
ٱلْحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ
لَا تَخَافُونَ ۖ فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُوا۟ فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَٰلِكَ
فَتْحًا قَرِيبًا ﴿٢٧﴾ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ
ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ﴿٢٨﴾

مُحَمَّد رَسُول — ٥١٤

نەتاندەناسین کە "لەشاری مەککەدا ﴿ان تطؤهم فتصيبكم منهم معرة بغير علم﴾ نەوەك ئێوە بێ ئاگایانە بیانکەنە بەژێر پێوە، دەرەنجام تیا چووبان، جا ئێوەیش عارو دڵ تەنگیتان تووش ببا، ئەگەر لەبەر ئەوانە نەبوایە مۆڵەت بەئێوە ئەدرا کە بڕۆنە مەککەوەو جەنگیان لەگەڵ بکەن، واتە: مەککەییەکان شایستەی ئەوە بوون هێرشیان بۆ کراباو جەنگیان لەگەڵ کرابا، چونکە:

یەکەم: خوانەناس و بێ بڕوا بوون.

دووەم: ئێوەیان لەتەوافی کەعبە گێڕایەوە.

سێیەم: نەیانهێشت قوربانیەکان بگەنە جێی خۆیان و سەر ببڕێن، بەڵام ئەگەر ئەو هێرشە کرابا پیاوو ژنانی موسڵمان لەو نێوانەدا - بەبێ ئاگایی ئێوە - ژێر پێ دەبوون و تیادەچوون، جا ئەوکاتە جۆرە زشتی و عارێکتان

ئەوقە دەبوو، ئەگەر ترسی ئەمە نەدەبوو، دەبوو جەنگیان لەگەڵ بکرایە ﴿لیدخل الله فی رحمته من یشاء﴾ خوا دەستتانی گرتەوە لێیان لە مەککەداو, لەپێش حودەیبییەدا مۆڵەتی نەدا لەگەڵیان بەجەنگێن.. بۆئەوەی خوا ویستی لەهەر کەسێك ببێ لە خەڵکی مەککە پێش ئەوەی کەبچنە ناوی بیخاتە ناو رەحمەت و میهرەبانی خۆیەوەو پاش پەیمانەکە موسڵمان ببن.. خۆ هەر وایش بوو، چونکە لەو ماوەیەدا زۆرێکیان لێ موسڵمان بوون ﴿لو تزیلوا لعذبنا الذین کفروا منهم عذابا الیما﴾ خۆ ئەگەر لەمەککەدا موسڵمانان و بێ بڕوایان لەیەکتر جیا بووبانەوە، ئەو دەمە بێ بڕواکانمان بە سزایەکی ئێش پێگەیەنەر ,بەکوشتن و دیل کردن سزا ئەدا ﴿[٢٦] إذ جعل الذین کفروا فی قلوبهم الحمیة﴾ وەبیر بێنە ئەوکاتە کافروبێباوەڕەکان دەمار گیرییان خستە دڵیانەوە ﴿حمیة الجاهلیة﴾ دەمارگیری سەردەمی نەزانیی، واتە: ئەوکاتە پێغەمبەرو هاوەڵانیان رێگری کرد لەزیارەتی کەعبە لە ساڵی حودەیبییەدا, لە ترسی ئەوەی عەرەبەکان بڵێن: پێغەمبەرو موسڵمانەکان بە زۆرە ملێ چوونە ناو مەککەوە,وەکاتێکیش ئێوە لە پەیماننامەکەی حودەیبییەدا نووسیتان: (بسم الله الرحمن الرحیم، محمد رسول الله). کەچی ئەوان لەبەر دەمارگیریی قبوڵیان نەکرد! بەڵێ کاتێ کە ئەوان رێگرییان لە ئێوە کرد بۆ زیارەتی کەعبەو بیانوویان ئەوەبوو وتیان: ئەگەر ئەمانە کاتی خۆی کەس و کاری ئێمەیان لەگۆڕەپانی جەنگدا کوشتووە، ئێستایش بێنە ناو مەککەوەو بێ روو بەڕوو بوونەوە بگەڕێنەوە تا دونیا دونیا بێ، ئێمە ئابڕوومان ئەچێت، تەنانەت عاریان لێدەهات قبووڵی ئەوە بکەن کە موحەممەد پێغەمبەرو نێرراوی خوا بێت، ﴿فأنزل الله سکینته علی رسوله وعلی المؤمنین﴾ جاخوا لەبەرامبەر ئەوەوە ئارامیی دابەزاندە نێو دڵی پێغەمبەرەکەی و سەردڵی موسڵمانەکان ,خۆیان گرت و تێك نەچوون و جەنگیان نەکرد لەگەڵ ئەو هەموو بڕو بیانووانەدا ﴿والزمهم کلمة التقوی﴾ لەسەر تەقواو وشەی (لا إله إلا الله)پابەندی کردن ,واتە: ناچار بوون بەبڕیارەکانی حودەیبیە ملکەچ بن تا هێزی موسڵمانەکان لێك نەترازێ و جیاوازی تێ نەکەوێ و نەبن بە دوو لەتەوە، ئەگینا ئەوەیان پێ قبوڵ نەدەکرا ﴿وکانوا أحق بها وأهلها﴾ ئەوانیش شایستەتر بوون بەوشەی تەقواو ئەهلیشی بوون ﴿وکان الله بکل شئ علیما﴾ وە بەردەوام خوا بەهەموو شتێ زاناو ئاگایە خۆی چاك ئەزانێ کێ شایستەی ئەو فەزڵەیە؟.

### خەونەکەی پێغەمبەر ﷺ:

﴿[٢٧] لقد صدق الله رسوله الرؤیا بالحق﴾ بێگومان خوا خەونی پەیامبەرەکەی خۆی بە راست گێڕاو هێنایە دی , پێغەمبەر ﷺ پێش ئەوە بچن بۆ حودەیبیە لەخەونیدا دیتی کەخۆی و هاوەڵاکانی, چوونەتە مەککەو تەواف و چەرخەی کەعبەیان کرد، هەندێکیان سەریان دەتاشی و، هەندێکی دی کورتیان دەکردەوەو، ئەویش خەونەکەی بۆ هاوەڵانی گێڕایەوەو ئەوانیش زۆر پێی دڵخۆش بوون، بەڵام کاتێ ئەوکارەساتەی حودەیبیە پێشهات، دوو رووەکان کردیان بە رۆژی خۆیان و وتیان: سوێند بە خوا نەك هەر ناچینە کەعبەوە، بەڵکو چاویشمان بە مەککە ناکەوێ، ئینجا خوا ئەو ئایەتەی (ولقد صدق الله...) نارد.(ئیبن کەسیر)یش هەروەك ئەم ریوایەتەی هێناوە. ﴿لتدخلن المسجد الحرام ان شاء الله﴾ سوێند ئەخۆم کە بێگومان ئەی موحەممەد ﷺ بەویستی خوا خۆتوو هاوەڵانت دەچنە ناو مزگەوتی حەرام ﴿آمنین محلقین رؤسکم ومقصرین﴾ بە بێترس لە هیچ کەسێك عومرەی خۆتان ئەکەن, سەرتان دەتاشن و، کورتی دەکەنەوە.

ئیمامی (بوخاریی)و (موسلیم) ئەڵێن: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (رحم الله المحلقین) خوایە ڕەحم بەوانە بکە سەریان تاشی، ئەوانیش. وتیان: ئەی ئەوکەسانەش کورتی دەکەنەوە؟ دووبارە فەرمووی: (رحم الله المحلقین).

وتیانـەوە: (و المقصـرین؟). ئـەویش بـۆ جـاری سـێیەم، یـان چـوارەم جـار، فـەرمووی: (والمقصـرین). فـتح الباری:٣/٦٥٦، مسلم:٢/٩٤٦ وە هەروەها ئیمامی (بوخاریی) لە (ئیبن عەبباس)ـە وە ئەڵێ: (لما قدم النبي ﷺ لعامه الذی استأمن قال: ارملوا، لیری المشرکین قوتهم، والمشرکون من قبل (قُعیقعان) فتح االباری: ٧/٥٨١.واتە:کاتێ پێغەمبەر ﷺ خۆی وهاوەڵانی چوونە مەککە (تاو لەرزی) مەدینە کزو لاوازی کردبوون، حاڵیان زۆر خراپ وناڕەحەت بوو، موشریکەکانیش وتیان: وەرن تەماشای ئەوانە بکەن لە مەدینەوە هاتوون، کە چۆن(تا) شپرزەی کردوون، جائەوانیش لەلای (حیجر) دا خۆیان مەڵاسدا بۆبینینیان، ئیتر خوا پێغەمبەرەکەی خۆی لێ وشیار کرد، ئەوسا ئەویش - بۆ ئەوەی موشریکان دڵخۆش نەبن بەو نەخۆشی و لەڕوولاوازییانەوە- بڕیاریدا کە سێ خولی نۆبەی یەکەمی تەوافەکە بە (رەمل) و گورگە لۆقە بێت، ئەوانیش هەرسی (شەوت)ـەکەیان بە گورگە لۆقە بڕی، ئیتر موشریکەکان زانییان ئەوەنەبوو ئەوان زانیبوویان! ئیمامی ئەحمەد: ١/٢٩٤﴿**لا تخافون**﴾ ناشترسن لە هیچ کەسێك ﴿**فعلم مالم تعلموا**﴾ جا ئەوەی ئێوە نەتاندەزانی، خوا زانی و ئاگادار بوو کە ئەو ڕیکەوتنەی حودەیبیە خێرێکی زۆری تێدایە بۆتان ﴿**فجعل من دون ذلك فتحا قريبا**﴾ ئینجا پێش چوونتانەوە نێو مەککە بەو شێوەیە، سەرکەوتنێکی تری نزیکی (گرتنیخەیبەر)ی هێنایە پێش بۆتان ﴿[28] **هو الذی ارسل رسوله بالهدی ودین الحق**﴾ هەر ئەو زاتەیە کە پەیامبەری خۆی بەقورئان و بەئاییینێکی ڕەواوە ڕەوانە کرد ﴿**لیظهره علی الدین کله**﴾ تا سەری بخات بەسەر هەموو بەرنامەو ئایینەکانی تردا ﴿**وکفی بالله شهیدا**﴾ وخوا خۆیشی بەسە شایەت بێت لەسەر ئەوە کە: موحەممەد پەیامبەرێتی، جا کەوایە بێ تاقەت مەبە لەوەی کە (سوهەیل) بە نووسینی (بسم الله.. محمد رسول الله ﷺ) رازیی نەبوو ﴿[29] **محمد رسول الله**﴾ موحەممەد ﷺ ڕەوانە کراوو پەیامبەری خوایە، پێیان خۆش بێت، یان نا ﴿**والذین معه اشداء علی الکفار رحماء بینهم**﴾ ئەو کەسانەش لەگەڵ ئەون و شوێنی ئەوکەوتوون لە بەرامبەر بێ بڕواکانا ئازاو بەهێزن، لەناو خۆشیاندا میهرەبان و بەسۆزو دڵ نەرمن. وەك لەسوورەتێکی تردا ئەفەرموێ: (فسوف یأتی الله بقوم یحبهم و یحبونه، أذلة علی المؤمنین، أعزة علی الکافرین) (٥/٥٤). یان ئەفەرموێ: (یا أیها الذین آمنوا قاتلوا الذین یلونکم من الکفار ولیجدوا فیکم غلظة/٩/١٢٣. یان ئەم فەرموودەیەکە دەفەرموێ: ((مثل المؤمنین فی توادهم وتراحمهم کمثل الجسد الواحد، اذا اشتکی منه عضو تداعی له سائر الجسد بالحمی والسهر)) مسلم: ٤/ ١٩٩٩. نموونەی بڕواداران بۆ یەکتر - لە بارەی خۆشەویستی و میهرەبانییانەوە - وەکو یەك جەستەو لاشن، دەبینی هەرکە ئەندامێکی لەشی دێتە ئێش، بەخێرایی ئەندامەکانی تری لاشەی (تا)و (شەونخونی) دایدە گرێ و ئۆقرە بە خۆناگرن.

لەفەزل و گەورەیی هاوەڵاندایە ئەم فەرموودەیە هاتووە: (لا تسبوا أصحابی فو الذي نفسي بیده! لو أن أحدکم انفق مثل أحد ذهباماادرك مد أحدهم ولا نصیفه) مسلم: ٤/١٩٦٧ واتە: جنێو بە هاوەڵانم مەدەن، سوێندم بەوەی گیانی منی بە دەستە! ئەگەر بە ئەندازەی چیای ئوحود، ئێوە زێڕ ببەخشن ناگاتە مستێکی، یا نیوەی ئەوەی ئەوان. یاخود (خیر الناس قرنی، ثم الذین یلونهم ثم الذین یلونهم)، بخاریی: ٦٤٢٩. (قورتوبی)یش ئەڵێ: (قلت: فالصحابة کلهم عدول، أولیاء الله تعالی وأصفیاؤه، و خیرته من خلقه بعد أنبیائه و رسله, هذا مذهب أهل السنة، والذی علیه الجماعة من أئمة هذه الأمة. وقدذهبت شرذمة - لا مبالاة بهم إلی أن حال الصحابة کحال غیرهم، فیلزم البحث عن عدالتهم، ومنهم من فرق بین حالهم فی بُداءة الأمر، فقال: إنهم کانوا علی العدالة إذ ذاك، ثم تغیرت بهم الأحوال، فظهرت فیهم الحروب و سفك الدماء، فلابد من البحث. و هذا مردود، فإن خیار الصحابة و فضلاءهم -

كعلى و طلحة والزبير و غيرهم رضى الله عنهم ممن أثنى الله عليهم و زكاهم، ورضى عنهم، و أرضاهم ووعدهم الجنة بقوله تعالى: (..مغفرة وأجرا عظيما). ﴿تراهم ركعا سجدا﴾ دەیانبینیت هەردەم خەریکی رکوع و سوژدەن, واتە: زۆر خەریکی خواپەرستیو نویژن، بە شەوا شەو نوێژ ئەکەن و، بە رۆژیشدا سوار چاکی مەیدانن ﴿يبتغون فضلا من الله ورضوانا﴾ هەموو کات ئاواتیان بەدەست هێنانی فەزڵ و بەهرەو میهرەبانیی و، خۆشنوودی خوایە, مەبەستیان ئەوەیە خوایان لیٚ رازیی بێت ﴿سيماهم فى وجوههم من اثر السوجود﴾ نیشانەیان لە شوێنەواری سوجدە بردنەکانیانەوە بۆ خوا لە روخساریاندا دیارە ,واتە: کرداریان شیرین و, کاریان چاك و پیرۆزە، زمانیان پاك و, دڵیان پاك و، رەوشتیان بەرزە ﴿ذلك مثلهم فى التوراة﴾، ئەوە وەسفیانە لە تەوراتدا ﴿ومثلهم فى الانجيل كزرع اخرج شطأه﴾ مەسەل و وەسفیان لە(ئینجیل)یشدا وەك کشتیٚ وایە کە لەسەرەتاوە وەچی دەرکردبیٚ ﴿فازره فاستغلظ﴾ ئینجا وەچەکە بە هێزیکردبیٚ,ئینجا ئەستووریش بووبیٚ ﴿فاستوى على سوقه﴾ ئەوسا لە سەر بنجەکانیشی وەستابیٚ ﴿يعجب الزراع﴾ ئەوەندە زوو هەڵ بداو گەشە بکات، وەرزێرو کشتەوانەکان سەرسام بکات, واتە: بۆ یەکەمجار هاوەڵانیش لەسەرەتای کارەوە کزولاوازبوون، پاشان وردە وردە زیادیان کردو، زۆرو بەهێز بوون و لەسەر پیٚی خۆیان راوەستان ﴿ليغيظ بهم الكفار﴾ خوا ئاوا بە ئەصحابی پێغەمبەر دەکا, بۆئەوەی رکی کافرەکانیان پیٚهەڵسێنیٚ. ئیمامی (مالیك) دەفەرمویٚ: (من اصبح وفى قلبه غيظ على أصحاب رسول الله , فقد أصابته هذه الآية).واتە: هەرکەسێك رۆژەوەی کردو, لەدڵیاکەمە رکێك بەرامبەر بە هاوەڵانی پێغەمبەر هەبوو, ئەوە بیٚشك ئەم ئایەتە گرتوویەتەوە.واتە:کافر دەبێت ﴿وعد الله الذين آمنوا وعملوا الصالحات منهم مغفرة وأجرا عظيما﴾ خوا بەڵێنی بەو کەسانە داوە بڕوایان هێناوەو کارەچاکەکانیان ئەنجام داوە، بە لێبوردنی تەواو و پاداشتێکی گەورە. بەڵی.. ئەوانە سیفەتی بەرزی هاوەڵان بوون، ئەوەیش باسکرا وێنەی پاداشتیان بوو، جا صیفاتی هەرکەسێك وەك صیفاتی ئەوان بیٚ، ئەوا لەریزی ئەواندا دەبیٚ. ئێمەیش لەخوای دلۆڤان دەخوازین: خۆشەویستی ئەوانمان بۆ زیاد بکات, کارو کردارو سیفەتەکانیان لەدەروونماندا بروێنیٚ. (اللهم ارزقنا محبتهم يارب العالمين).

الجزء السادس والعشرون — سورة الحجرات

مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ تَرَاهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِمْ مِنْ أَثَرِ السُّجُودِ ذَٰلِكَ مَثَلُهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَمَثَلُهُمْ فِي الْإِنْجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْأَهُ فَآزَرَهُ فَاسْتَغْلَظَ فَاسْتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِ يُعْجِبُ الزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ الْكُفَّارَ وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ مِنْهُمْ مَغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا (٢٩)

## سُورَةُ الحُجُرَاتِ

ترتيبها ٤٩ — آياتها ١٨

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ (١) يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ وَلَا تَجْهَرُوا لَهُ بِالْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ أَنْ تَحْبَطَ أَعْمَالُكُمْ وَأَنْتُمْ لَا تَشْعُرُونَ (٢) إِنَّ الَّذِينَ يَغُضُّونَ أَصْوَاتَهُمْ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ امْتَحَنَ اللَّهُ قُلُوبَهُمْ لِلتَّقْوَىٰ لَهُمْ مَغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ عَظِيمٌ (٣) إِنَّ الَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِنْ وَرَاءِ الْحُجُرَاتِ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ (٤)

٥١٥

کۆتایی سوورەتی (فەتح), زۆریش سوپاس بۆ خوای جوانکار.

*** *** ***

## ٤٩- سوورەتی ( حوجورات )ـە
## مەدەنییەو ( ١٨ ) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتە هەرچەندە کورت بێ، بەڵام چەندین یاسای ئەخلاقیی بەرزی پیرۆزی تیایە، جا لەبەر گرنگی دانی بەئەخلاق هەندێ لەراڤەکەرانی قورئان بەناوی سوورەی ئەخلاقەوە ناویان بردوە، بۆ یەکەم جار باسی ئەدەب و ویڵێکی بەرز ئەکات سەبارەت بە رەفتار کردن لەگەڵ فەرمانەکانی خواو گوێرایەڵی کردنی پەیامبەرو مەشۆرەت پێکردنی لەهەر کارێکدا سەر هەڵ بدات:(یا أیها الذین آمنوا لا تقدموا بین یدی الله ورسوله..) ئینجائەدەب و ویڵێکی تری بەرزو بڵند دا ئەمەزرێنێ، بۆ ئەوەی کاتێ ئەیانەوێ لەخزمەت پەیامبەردا ﷺ وتوو وێژ بکەن، لەبەر قەدردانان و پێزانینی رێزی ئەو، دەنگ بەرز نەکەنەوە، وەئەبێ لەگەڵیا وەك خەڵکی تر نەبن، بەڵکودەبێ زۆر بەوێڵ و بەئەدەبەوە قسەی لەگەڵ بکەن، پاشان وانەیەکی گشتیی بۆ موسڵمانان کە: نابێ گوێ بگرن بۆ (اشاعات — دەنگۆ)، ئەگەر شتێکی وابوو، ئەبێ هەوڵی جددی بدرێ تا بزانرێ ئەو دەنگۆیە چەندە حەقیقەتی هەیە، ئەگینا بەپەلە لێکردنی گەلێ کار ئەنجام ئەدەن، پاشان پەشیمان ئەبنەوە.. خۆ زۆرجارانیش پیاو خراپێك وشەیەکی هێناوەو بۆتە هۆی دروستبوونی رووداوێکی هەرە گەورە, پاشان پەشیمانی بەدوادا هاتووە.. باسی سوڵح و رێکخستنی نێوان دوولایەنی ناکۆکی ئیماندار ئەکات، ئینجا هۆشیاری ئەدات کە لاقرتیی و سووکایەتی بە خەڵکی نەکرێ، هەروەك غەیبەت و سیخوڕایەتیی و بەد گومانیی قێزەون ئەکات، تا هیچ کەسێك لێیان نزیك نەبێتەوە.. کۆتاییشی دێت بەوە کە باوەڕوئیمان تەنها شتێکی سەر زاریی نییە کە بەزمان بوترێ! هەندێ خوو و سیفاتی بەرزی بڕواداران لەگەڵ هەڵنانیان بۆ جیهاد باس ئەکا. وە لەبەر رێزلێنان لەحاڵ و ماڵ و مەنزڵەکانی پەیامبەر ﷺ کە خێزانەکانی تیابووە، بەم سوورەتە ئەڵێن: (حوجورات).

### موسڵمان نابێ پێشی خواو پێغەمبەر کەوێ:

﴿بسم الله الرحمن الرحیم * [١] یاایها الذین آمنوا لا تقدموا بین یدی الله ورسوله﴾ ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە! پێشی خواو پەیامبەری خوا مەکەون , لەهیچ کارێك لە کاری دین ودنیادا، کاتێ پرسیارێك لەپێغەمبەر کرا، ئێوەپێش ئەو وەڵام مەدەنەوە، لەرۆیشتندا پێشی مەکەون، لەخۆتانەوە بڕیار مەدەن.. هتد.ئیمامی (بوخاریی) فتح الباری: ٤٥٤). لە (عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر)ـەوە دەڵێ: کاروانێ —بەنوێنەرایەتی هۆزی (بەنی تەمیم) هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ پاشان لەکاتی گەڕانەوەیدا (ئەبوبەکر) وتی: (قەعقاع) بکە بەئەمیریان، (عومەر)یش وتی: نا، (ئەقرەعی کوڕی حابیس!) ئەبوبەکر وتی: وا ئە زانم تۆ هەر ئەتەوێ قسەی من بشکێنێ. عومەر وتی: هەرگیز ئەوەم نەویستوە، دەرەنجام کەوتنە قسەو دەنگیان بەرز بوویەوە، ئیتر ئایەتی: (یا أیها الذین آمنوا لا تقدموا بین یدی الله ورسوله..) هات. ﴿واتقوا الله إن الله سمیع علیم﴾ لەخوا بترسن و لەسنوورەکانی لامەدەن چونکە بەراستیی خوا بیسندەیە بەوتەکانتان، زانایە بە ئیش و کارەکانتان.

### ئەدەب و وێڵ لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ :

﴿[٢] یاایهاالذین آمنوا لاترفعوا اصواتکم فوق صوت النبی﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! هەرکات لەگەڵ پەیامبەردا ﷺ گفتوگۆتان کرد, دەنگتان بەسەر دەنگیدا بەرز مەکەنەوە ,بەچ ئەندازەیە دەنگی ئێوەی ئەگاتێ، دەبێ هەر ئەوەندە دەنگ بەرز بکەنەوە ﴿ولا تجهروا له بالقول﴾ و قسەی بەرز و بێ پەردە مەکەن لەڕوویدا، پێشەوا

(بوخاریی) فتح الباری: ٤٥٤/٨ له (ئیبن ئەبی مولەیکە)وە دەڵێ: خەریك بوو دوو پیاوەچاکەکە -ئەبوو بەکرو عومەر تیا بچن! جا (هاتنی نوێنەرەکەی بەنی تەمیمی گێڕایەوەو پاشان گوتی): ئیتر عومەر دوای ئەوە هەر قسەیەکی کردبا، ئەوەندە بەهێواشی دەیکرد پێغەمبەر ﷺ داوای دووبارە کردنەوەی لێدەکرد! ﴿کجهر بعضکم لبعض﴾ وەك چۆن لەگەڵ یەکتریدا بەدەنگی بەرزو، رووبەڕوو قسە ئەکەن و دەنگ بەرز ئەکەنەوە، وە بە ناوی خۆیەوە وەك بڵێیت موحەممەد ﷺ نابێ بانگی لێ بکەن، بەڵکو بە نازناوەکانی بانگی لێ بکەن: وەك بڵێیت: (یا ایها النبی! یا أبا القاسم!).ئیمامی (ئیبن کەسیر) ئەڵێت: زاناکان وتوویانە- هەروەك دەنگ بەرز کردنەوە لە حاڵی ژیانی پێغەمبەر خۆیداﷺ کارێکی خراپ و ناپەسەندە، پاش مردنی و لەلای گۆڕەکەیشیدا هەروا. ﴿أن تحبط أعمالکم﴾ نەوەك بەو هۆیەوە کردەوەکانتان بەتاڵ و پووچەڵ ببنەوە ﴿وانتم لا تشعرون﴾ و بە خۆیشتان نەزانن. بەڵێ موسڵمانانی پێشوو زۆر لەهەوڵدا بوون بۆجێبەجێ کردنی ئەم یاسای ئەدەب و ویڵە، ئەوەتە وەك ئیمامی ئەحمەد (خوا لێی رازی بێ) دەڵێت: (سابتی کوڕی قەیس)، دواندەری پەیامبەرو یارمەتیدەران لەبەر ئەوە دەنگی گەورەو بەرزبوو، گەلێ جار نەئەچووەلای پەیامبەر ﷺ!. ﴿[٣] إن الذین یغضون أصواتهم عند رسول الله﴾ بێگومان ئەوانەی لە کۆڕیپەیامبەری خوادا دەنگیان هێواش دەکەنەوە ﴿اولئك الذین امتحن الله قلوبهم للتقوی﴾ ئائەوانە ئەوکەسانەن کە خوا دڵی زاخاوداون بۆپارێزگاریی و، خۆپاراستن لە هەموو کارێکی ناڕەواو خراپ ﴿لهم مغفرة واجر عظیم﴾ لێبوردن وپاداشتێکی گەورەشیان لەبەهەشتدا بۆهەیە.

وَلَوْ أَنَّهُمْ صَبَرُوا حَتَّىٰ تَخْرُجَ إِلَيْهِمْ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ ۚ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن جَاءَكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوا أَن تُصِيبُوا قَوْمًا بِجَهَالَةٍ فَتُصْبِحُوا عَلَىٰ مَا فَعَلْتُمْ نَادِمِينَ ﴿٦﴾ وَاعْلَمُوا أَنَّ فِيكُمْ رَسُولَ اللَّهِ ۚ لَوْ يُطِيعُكُمْ فِي كَثِيرٍ مِّنَ الْأَمْرِ لَعَنِتُّمْ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ حَبَّبَ إِلَيْكُمُ الْإِيمَانَ وَزَيَّنَهُ فِي قُلُوبِكُمْ وَكَرَّهَ إِلَيْكُمُ الْكُفْرَ وَالْفُسُوقَ وَالْعِصْيَانَ ۚ أُولَٰئِكَ هُمُ الرَّاشِدُونَ ﴿٧﴾ فَضْلًا مِّنَ اللَّهِ وَنِعْمَةً ۚ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٨﴾ وَإِن طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا ۖ فَإِن بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الْأُخْرَىٰ فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّىٰ تَفِيءَ إِلَىٰ أَمْرِ اللَّهِ ۚ فَإِن فَاءَتْ فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا بِالْعَدْلِ وَأَقْسِطُوا ۖ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ ﴿٩﴾ إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ ۚ وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿١٠﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا يَسْخَرْ قَوْمٌ مِّن قَوْمٍ عَسَىٰ أَن يَكُونُوا خَيْرًا مِّنْهُمْ وَلَا نِسَاءٌ مِّن نِّسَاءٍ عَسَىٰ أَن يَكُنَّ خَيْرًا مِّنْهُنَّ ۖ وَلَا تَلْمِزُوا أَنفُسَكُمْ وَلَا تَنَابَزُوا بِالْأَلْقَابِ ۖ بِئْسَ الِاسْمُ الْفُسُوقُ بَعْدَ الْإِيمَانِ ۚ وَمَن لَّمْ يَتُبْ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ ﴿١١﴾

**لە دوورەوە لە پێغەمبەر بانگ مەکەن:**

﴿[٤] إن الذین ینادونك من وراء الحجرات أکثرهم لا یعقلون﴾ بەڕاستی ئەوانەی لە دەرەوەی هۆدەکان (حوجرەکانە) وە بەناوی خۆتەوە: (ئەی موحەممەد! ئەی موحەممەد!) بانگت دەکەن،ئەوانە - وەك ئیمام ئەحمەد هێناویەتی- زۆربەیان تێناگەن و ڕێزو پلەی تۆ نازانن، ئەگەرنا وایان نەئەکرد ﴿[٥] ولو انهم صبروا حتی تخرج إلیهم﴾ خۆ ئەگەر ئارامیان بگرتایەو لەدوورەوە بانگیان نەکردیتایە تا تۆ دەردەچووی بۆلایان ﴿لکان خیرا لهم﴾ چاکترو باشتربوو بۆیان لە ئایینکەیاندا ﴿والله غفور رحیم﴾ وە خوایش خوایەکی گوناهپۆشی میهرەبانە.

**هەواڵێکتان بۆ دێ، بە وردیی لێی بکۆڵنەوە:**

﴿[٦] یاایهاالذین آمنوا إن جاءکم فاسق بنبإ فتبینوا﴾ ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئەگەر کەسێکی متمانە پێنەکراوو (فاسق) هەواڵێکی بۆ هێنان خێرا بڕوای پێ مەکەن، بەڵکو لێی بکۆڵنەوە. ڕاڤەکەرانی قورئان ئەڵێن: پەیامبەر ﷺ نوێنەرێکی خۆی ناردە لای (حاریسی کوڕی ضرار) بۆ هێنان و وەرگرتنی ئەو بەشە زەکاتەی کە

لەخەڵکەکە کۆی کردبوویەوە، جا کاتێ ئەو نوێنەرە ڕۆیشت و نزیك بوویەوە، لەبەر هەندێ شتی کۆنی نێوانیان ترسی لێ نیشت! پاشان گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پەیامبەری خوا! زەکاتیان نەداو ویستیشیان بمکوژن! ئینجا ئەویش هاوەڵانی خۆی کۆ کردەوەو مەشوورەتی پێکردن تا بڕوا جەنگیان لەگەڵ بکات، ئەوسا ئایەتی: ﴿یا أیها الذین آمنوا إن جاءکم فاسق..﴾ هات، ئیمامی (ئەحمەد). ﴿أن تصیبوا قوما بجهالة﴾ نەوەك بە نەزانی بەخەڵکێکا هەڵبتەقێن و ئازارو بێزاریان بدەن ﴿فتصبحوا علی مافعلتم نادمین﴾ ئەوجا لەو کارەی کردوتانە پەشیمان ببنەوە. ئەم ئایەتە چ یادەوەریی و وانەیەکی شیرین و بڵندە، بەتایبەت بۆ سەرکردەو فەرماندەکان؟! هەر بۆیە پاش ئەوە پێغەمبەر ﷺ ئەیفەرموو: (التبین من الله، والعجلة من الشیطان) (تەبەریی). واتە: لێکۆڵینەوە لەڕووداوو پێشهاتەکان بەبڕیارو پێخۆش بوونی خوایە، پەلەو لێنەکۆڵینەوە ولەزیش لەشەیتانە وەیە. ﴿[٧] واعلموا أن فیکم رسول الله﴾ ئێوە بزانن کە بەراستی پەیامبەری خواتان تێدایە ﴿لو یطیعکم فی کثیر من الأمر لعنتم﴾ ئەگەر لەبەشی زۆری ئێش و کارەکاندا بەقسەی ئێوە بکاو وەڵامتان بداتەوە، ئەزیەتبارو دووچاری کاری سەخت ئەبن ﴿ولکن الله حبب إلیکم الإیمان﴾ بەڵام خوا ئیمان و بڕوای لا خۆشەویست کردن، ﴿وزینه فی قلوبکم﴾ وە لەنێو دڵتانا شیرینی کردو رازانیەوە ﴿وکره إلیکم الکفر والفسوق والعصیان﴾ وە بێ بڕوایی و فیسق و بێ دینی لەلاتان تاڵ و ناشرین کرد ﴿أولئك هم الراشدون﴾ ئا ئەوانە ئاوابن ڕێگەیان دەر کردووەو دامەزراون ﴿[٨] فضلا من الله ونعمة﴾ ئەمەش خۆی بەخشش و نیعمەتێکی تایبەتییە لەلایەن خواوە ڕشتوویەتی بەسەرتانا ﴿والله علیم حکیم﴾ وە خواش زانایە ئەزانێ کێ شایستەی هیدایەت و ڕێنموونیە،کار جوانیشە لەبەڕێوەبردنی ئیش و کاردا، جا کەوابوو ڕێز لە پەیامبەرەکەتان بگرن و لەگەڵیا وێڵ و ئەدەبتان بێ.

**ئەر دوو گرۆی موسڵمان ناکۆك بوو ن، ئاشتیان بکەنەوە:**

﴿[٩] و إن طائفتان من المؤمنین اقتتلوا﴾ ئەگەر دوو دەستە لە باوەڕداران پێکەوە بەجەنگ هاتن ﴿فأصلحوا بینهما﴾ جا هەرچی تواناتان هەیە بەکاری بێنن و ئاشتیان بکەنەوەو بانگیان بکەن بۆلای بڕیارەکانی خوا پێشەوا (بوخاریی و، موسلیم) لەئەنەسەوە -خوا لێی رازی بێت- ئەگێڕنەوە: پەیامبەر ﷺ بەسواری گوێدرێژێك لەگەڵ کۆمەڵێ لە موسڵمانەکان دێت بۆ لای، جا کاتێ گەیشت عەبدوڵڵا پێی وت: لێم وە دووربە، سوێند بەخوا بۆگەنی کەرەکەت ناڕەحەتی کردم، لەولایشەوە پیاوێکی یارمەتیدەر وەڵامی دایەوەو وتی: (والله لَحمارُ رسول الله أطیب ریحا منك!!) سوێند بەخوا بۆنی گوێدرێژەکەی پێغەمبەر لەبۆنی تۆ خۆشترە، لەولایشەوە پیاوێکی خزمی عەبدوڵڵا لەپیاوە یارمەتیدەرەکە تووڕە بوو، دەرەنجام بە پێڵاوو تاکە نەعل و مستە کۆڵە هاتن بە یەکاو خەریکبوو شتەکە گەورە ببێت! ئیتر خوای گەورە ئەم ئایەتەی: (وإن طائفتان..)ی نارد. ڕیوایەتێکی تر دەڵێت: ئەوئایەتە سەبارەت بە جەنگ و ئاژاوەی نێوان ئەوس و خەزرەج هاتووە، شیاوی باسە ئەوەیش دەگەیەنێت کە دەستەو تاقمی (بوغات) (وەك ئیمامی بوخاریی ئەڵێت: لە چوارچێوەی ئیسلامەتی دەر ناچن، بۆیە هەرکات دەستیان لەجەنگ هەڵگرت، ئیتر وازیان لێ ئەهێنرێ.

ئیمامی بوخاری: ٣٦١/٥. لە (ئەبی بەکرە)وە ئەڵێت: ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ لەسەر مینبەر فەرمووی: (ان ابنی هذا سید، ولعل الله أن یصلح به بین فئتین عظیمتین من المسلمین). ئەم کوڕەم -حەسەنی کچەزای- پیاوێکی بەڕێزو شەریفە، ئومێدەوارم لە ئایندەدا خوای گەورە ئاگری دوو دەستە و تاقمی گەورەی موسڵمانانی پێ بکوژێتەوە. ﴿فإن بغت إحداهما علی الأخری﴾ جا ئەگەر دەستەیەکیان دەست درێژیی کردە سەر دەستەکەیتر، واتە: ملی

رانەکێشا بۆ ئاشتیی و یەککەوتن ﴿فقاتلوا التی تبغی حتی تفئ إلی أمر الله﴾ ئەوا ئێوەش لەگەڵ ئەو کۆمەڵە یاندا بجەنگێن کە دەستدرێژی دەکات تا ناچار ئەبێ و ئەگەڕێتەوە بۆ بڕیارو حوکمی خوا، هەروەها (انصر أخاك ظالما او مظلوما) هاتووە ﴿فإن فاءت فأصلحوا بینهما بالعدل﴾ ئینجا ئەگەر کۆمەڵە ستەمکارەکە گەڕایەوە بۆ حوکمی خوا، جا ئێوەیش بەئینصاف ناوبژییان بکەن ﴿وأقسطوا﴾ وە دادپەروەر بن و بەلای هیچ کەسێکیاندا دامەبڕن ﴿إن الله یحب المقسطین﴾ چونکە بێگومان خوا دادپەروەرانی خۆش ئەوێ ﴿[10] إنما المؤمنون إخوة﴾ بەڕاستی هەر بڕواداران برای یەکن ﴿فأصلحوا بین اخویکم﴾ جا ئەگەر لەنێوان دوو براتاندا، ناکۆکی پەیدا بوو ئێوەش بەزوویی نێوانیان چاك بکەن و ئاشتیان بکەنەوە ﴿و اتقوا الله لعلکم ترحمون﴾ هەمیشە لەخوا بترسن لەهەموو گوتارو کردارێکتاندا، بەشکو خوا رەحمتان پێبکات.

## گاڵتەو سووکایەتی بەیەکتر مەکەن:

﴿[11] یاایهاالذین آمنوا لا یسخر قوم من قوم﴾ ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! با هیچ گەلە پیاوێکتان گاڵتەو مەسخەرە بەگەلە پیاوێکی دی نەکات ﴿عسی ان یکونوا خیرا منهم﴾ لەوانەیە گاڵتە پێکراوەکان (لای خوا) لە گاڵتەچیەکان چاکتر بن ﴿و لا نساء من نساء﴾ وە هەروەها با کۆمەڵە ژنێ لە ژنانیش، گاڵتە بەکۆمەڵە ژنانێ تر نەکەن. ﴿عسی ان یکن خیرا منهن﴾ چونکە لەوانەیە ژنە گاڵتە پێکراوەکان لای خوا لەگاڵتەچیەکان باشتر بن تەرازووی چاکیی و، خراپیی تەنها لای خوایە. هەر ئەمەیە کە پێغەمبەرﷺ ئەفەرمووێ: (الکبر بطر الحق و غمط الناس — و یروی — و غمض الناس). واتە: تەکەبرو خۆ بەزلزانین ئینکاری هەق و کەم و سووك سەیر کردنی خەڵکە ﴿ولا تلمزوا انفسکم﴾ وە تانەو تەشەر لەیەکتر مەدەن و یەکتر عەیبدار مەکەن. بۆ یە فەرمووی: (و لاتلمزوا انفسکم) چونکە تانەو توانج گرتن لەموسڵمانان وەکو توانجت لە خۆت گرتبێ وایە، لەبەرئەوە موسڵمان هەموو وەکو یەك لاشەو یەك تەن وانە ﴿ولا تنابزوا بالالقاب﴾ وە ناوو ناتۆرەو نیتکە لەیەکتر مەنێن، واتە: بە ناتۆرە بانگی یەکتر مەکەن. (ئەبو جوبەیرە) دەڵێ: مرۆڤی وا هەبوو دووناو، یا سێ ناوی لێ نرابوو، رێك دەکەوت بەیەکێ لەو ناوانە قەڵس بێ، جا ئایەتی: (ولا تنابزوا بالالقاب) هات. ئیمامی (ترمزیی، ئەبوداود): ٢٤٦/٥. ئیبن ماجە، پێشەوا ئەحمەد: ٤٦٠/٤. ئیبن جەریر، حاکیم) ریوایەتیان کردووە ﴿بئس الإسم الفسوق بعد الإیمان﴾ دەرچوون لە شەرع بەدناو زڕاوییە دوای باوەڕهێنان. واتە: ئەو جۆرە کارانە ئەبێتە مایەی فاسق بوون و دوور کەوتنەوە لەئیمان ﴿ومن لم یتب فأولئك هم الظالمون﴾ ئەوەی تەوبە نەکاو پەشیمان نەبێتەوە هەر ئەوانەن ستەمکارەکان.

## لەبەدگومانی خۆ بپارێزن:

﴿[12] یاأیهاالذین آمنوا اجتنبوا کثیرا من الظن﴾ ئەی ئەوکەسانەی بڕواتان هێناوە! خۆتان لەزۆرێك لەگومان بردن بەیەکتر دووربگرن ﴿إن بعض الظن إثم﴾ چونکە هەندێ لەو گومانانە مایەی گوناه و دووچار بوونتانە لای خوا.

(عبداللەی کوڕی عەمر) (خوا لێی رازی بێ) ئەڵێ: پێغەمبەر ﷺ تەوافی کابەی دەکرد، و ئەی فەرموو: (ما اطیبك واطیب ریحك! ما أعظمك واعظم حرمتك! والذي نفس محمد بیده لحرمة المؤمن اعظم عندالله حرمة منك، ماله و دمه، وأن تظن به الا خیرا) ئیبن ماجە کتاب الفتن: ١٢٩٧/٢. چەندە پاکیت و چەندە بۆنت خۆشە! چەندە گەورە و خاوەن حورمەتیی بەو زاتەی کە گیانی (محمد)ی بەدەستە، حورمەت و رێزی مرۆڤی بڕوادار لای خوا لەتۆ گەورەترەو ماڵ و دارایی و خوێنی خاوەن حورمەتە وە هەردەم دەبێ چاوەڕوانی خێری لێبکەین ﴿ولا تجسسوا﴾ وە

بەدوای عەیب و عارو کەم و کوڕی یەکتردا مەگەڕێن و چاوە چاو مەکەن. (إياكم و الظن فإن الظن أكذب الحديث، ولا تجسسوا ولا تحسسوا ولا تنافسوا ولا تحاسدوا، ولا تباغضوا، ولا تدابروا، وكونوا عباد الله إخوانا) بوخاریی: فتح الباری: ٤٩٩/٧. واتە: وشیار بن لە گومان بردن! چونکە گومان لە هەر قسەیە درۆترە، وە سیخوڕی مەکەن ﴿ولا يغتب بعضكم بعضا﴾ و لەپاش ملە ناوی یەکتر بەخراپە مەبەن ﴿ايحب احدكم ان يأكل لحم اخيه ميتا﴾ ئایا کەستان پێی خۆشە گۆشتی برای خۆی بە مردوویی بخوات؟! دیارە ئەمە ئەوپەڕی ناشیرین کردنی ئەوکارەیە، تا مرۆڤەکان سڵی لێ بکەنەوەو نەیکەن ﴿فكرهتموه﴾ ئاشکرایە کە ئەوەتان زۆر پێ ناخۆشەو، حەزی لێناکەن و نایخۆن ﴿واتقوا الله﴾ وە لەخوا بترسن و سنوورەکانی مەشکێنن ﴿إن الله تواب رحيم﴾ بێگومان خوا زۆر لێبوردەیە بۆ هەرکەسێك پەشیمان بێتەوە لەو کارە ناشیرینانەی کردوویەتی، زۆریش میهرەبانە لەگەڵ بەندەکانی خۆیدا. ئەبو هورەیرە) ئەڵێ: وتیان بەپێغەمبەر غەیبەت چیە؟ ئەویش فەرمووی: (ذكرك أخاك بما يكره). ناو هێنانی براکەت بەهەر شێوەیەك پێی ناخۆش بێ، کابرا وتی: باشە ئەگەر ئەوەی من پێی ئەڵێم وابوو؟ هەر بەغەیبەت دادەنرێ؟ فەرمووی: (إن كان فيه ما تقول فقد اغتبته، وإن لم يكن فيه ماتقول فقد بهته) ئەبووداود: ١٩١/٥. واتە: بەڵێ ئەگەر ئەوەی تۆ ئەیڵێیت وابوو، ئەوە غەیبەتت کردووە، ئەگەر نا، ئەوە بوختانت بۆ کردووە.

الجزء السادس والعشرون — سورة الحجرات

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱجْتَنِبُوا۟ كَثِيرًا مِّنَ ٱلظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ ٱلظَّنِّ إِثْمٌ
وَلَا تَجَسَّسُوا۟ وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًا ۚ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن
يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٌ
رَّحِيمٌ ﴿١٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَٰكُمْ
شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ
عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾ ۞ قَالَتِ ٱلْأَعْرَابُ ءَامَنَّا ۖ قُل لَّمْ تُؤْمِنُوا۟ وَلَٰكِن
قُولُوٓا۟ أَسْلَمْنَا وَلَمَّا يَدْخُلِ ٱلْإِيمَٰنُ فِى قُلُوبِكُمْ ۖ وَإِن تُطِيعُوا۟ ٱللَّهَ
وَرَسُولَهُۥ لَا يَلِتْكُم مِّنْ أَعْمَٰلِكُمْ شَيْـًٔا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤﴾
إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا۟
وَجَٰهَدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ
ٱلصَّٰدِقُونَ ﴿١٥﴾ قُلْ أَتُعَلِّمُونَ ٱللَّهَ بِدِينِكُمْ وَٱللَّهُ
يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ
﴿١٦﴾ يَمُنُّونَ عَلَيْكَ أَنْ أَسْلَمُوا۟ ۖ قُل لَّا تَمُنُّوا۟ عَلَىَّ إِسْلَٰمَكُم ۖ بَلِ ٱللَّهُ
يَمُنُّ عَلَيْكُمْ أَنْ هَدَىٰكُمْ لِلْإِيمَٰنِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ
يَعْلَمُ غَيْبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٨﴾

٥١٧

**خوا کردوونی بە چەند گەل و هۆزێك بۆ ناسینی یەکتر:**

﴿[١٣] ياايهاالناس إنا خلقناكم من ذكر وانثى﴾ ئەی خەڵکینە! بێگومان ئێوەمان لەپیاوو ژنێك دروستکردووە، واتە: لە ئادەم و حەوا، جا ئیتر ئەم هەموو سووکایەتیە چیە بەیەکتری ئەکەن؟ بۆچی ئەگەر (بیلال) بۆ سەربانی کەعبە سەرکەوێ ئێوە پێتان ناخۆشە، هەر لەبەر ئەوە کە کاتی خۆی کۆیلە بووە؟ ﴿وجعلناكم شعوبا وقبائل لتعارفوا﴾ کردوومانن بەچەند گەل و تیرەیەك تا یەکتری بناسن، نەك بۆ گاڵتە کردن و تانەو تەشەردان لەیەکترو ستەم لەیەکتر کردن ﴿إن أكرمكم عند الله اتقاكم﴾ بێگومان بەڕێزترتیشتان لای خوا، ئەوەتانە کە بەتەقوا ترو خۆ پارێزتر بێت، وە لەسنوورەکانی خوا نەترازێت ﴿إن الله عليم خبير﴾ بەڕاستیی خوا بەبەندەکانی خۆی زانایە، بەدڵ و دەروونیان بەئاگایە. (ئەبوو هورەیرە) ئەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (تعلموا من انسابكم ما تصلون به ارحامكم) تیرمزیی: کتاب البر: ١٥٠/٨. واتە: ئەوەندە کە خزمانی خۆتانی پێ بناسن، ڕشتەو نەژادو نەسەبی خۆتان بزانن، واتە بزانن لەهۆزو خێڵی کێن تا سەردانی یەکتر بکەن و بەدەم کێشەکانیانەوە بچن.

## جیاوازیی نێوان ئیسلام و ئیمان:

﴿[١٤] قالت الأعراب آمنا﴾ عەرەبە دەشتەکییەکان وتیان: بڕوامان هێناوە بەخواو بەپەیامبەری خوا ﴿قل لم تؤمنوا﴾ بڵێ: نەخێر، باوەڕتان نەهێناوە ﴿ولكن قولوا اسلمنا﴾ بەڵام بڵێن: هەر لەترسی کوشتن و دیل بوون موسڵمان و ملکەچ بووین بڕوا هێنان هەیەو خۆ بەدەستەوەدان هەیە، ئەوەی ئێوە تەنها سەرزارییەو، لەدڵدا راست ناکەن، هەر لەبەر ئەمەیشە کە هەندێ لە زاناکان ئەڵێن: ئیمان و ئیسلام دوو زاراوەی جیاوازن. لەکاتێکی گرانیی و وشکە ساڵدا دەستەیەك لەعەرەبە دەوارنشینەکان هاتنە مەدینەو منەتیان سەر پەیامبەر ﷺ نا، کە موسڵمان بوون، وتیان: ئەی پەیامبەری خوا! بڕوامان هێناوە، ئێمە وەك هۆزی فلان و فلان جەنگت لەگەڵ ناکەین بەڵێ، لەو قسەو باسانەیان زۆر گوت! ئەوجا ئەم ئایەتە: ﴿وقالت الاعرب آمنا..﴾ هات. وە ئایەتەکە بە راشکاوی گەیاندی کە وشەو مانای بڕوا (إیمان) گەلێ فراوا نترو گەورە ترەلە وشەو مانای ئیسلام.. چونکە باوەڕ (إیمان) بەدڵ وبەزمان وبەکردەوە (اعتقاد، قول، عمل) دەبێت، بەڵام ئیسلام بوون بە خۆ بەدەستەوەدان و ملکەچ بوونێکی رواڵەتیش دەبێ، جا خوا هۆشیاری کردنەوە کە ئیمانی راستەقینە دەبێ کردەوەش پشتگیری بکات. ﴿ولما يدخل الإيمان في قلوبكم﴾ وە هێشتا بڕوا نەچووەتە نێو دڵتانەوە ﴿وإن تطيعوا الله ورسوله لا يلتكم من اعمالكم شيئا﴾ ئەگەر گوێڕایەڵی خواو پەیامبەری خوابن، ئەوا خواش هیچ شتێك لەپاداشتی کردەوەکانتان کەم ناکاتەوە و بەتێرو تەسەلی پاداشتتان ئەداتەوە ﴿إن الله غفور رحيم﴾ بەراستیی خوا، خوایە کی لێبوردەو میهرەبانە ﴿[١٥] إنما المؤمنون الذين آمنوا بالله ورسوله﴾ بێگومان بڕوادارەکان تەنها ئەو کەسانەن کە باوەڕیان بەخواو بەپەیامبەری خوا هێناوە ﴿ثم لم يرتابوا﴾ لەپاشا گومانیان نەبوو لە ئیمانە کەیاندا ﴿وجاهدوا بأموالهم وانفسهم في سبيل الله﴾ و بە سامان و گیانیانەوە جیهادیان کرد لە رێی خوادا ﴿اولئك هم الصادقون﴾ هەر ئەوکەسانەشن راستگۆیان لەداوای بڕوادا، بڕواش هەر ئاوا ئەبێت ﴿[١٦] قل اتعلمون الله بدينكم﴾ پێیان بڵێ ئاخۆ دەتانەوێ خوا ئاگادار بکەن لەو دینەی هەتانە ﴿والله يعلم ما في السموات وما في الأرض﴾ خوا لەهەرشتێ لەئاسمانەکان و زەمیندایە ئاگادارە ﴿والله بكل شئ عليم﴾ خوا بەهەموو شتێك زانایە هیچ شتێکی لەدەست دەرناچێ و لێی گوم نابێت ﴿[١٧] يمنون عليك ان اسلموا﴾ ئەوانە بە ئیسلام بوونیان منەت دەکەن بەسەر تۆدا ﴿قل لا تمنوا عليّ إسلامكم﴾ تۆش پێیان بڵێ: منەت مەکەن بەسەرمدا لەسەر موسڵمان بوونتان ﴿بل الله يمن عليكم ان هداكم للإيمان إن كنتم صادقين﴾ بەڵکو خوا منەت دەکات بەسەرتاندا کە ئێوەی رێنمایی کردووە بۆ ئیمان و بڕوا ئەگەر ئێوە لەداوای بڕوا هێناندا راستگۆ بن، پێغەمبەر ﷺ لە (حونەین)دا بەئەنسارییەکانی فەرموو: (یا معشر الأنصار(ألم ضلالاً فهداكم الله بي؟ وكنتم متفرقين فألفكم الله بي، وعالة فأغناكم الله بي؟) ئەی کۆمەڵی ئەنسار!: مەگەر ئێوە سەرلێشێواو نەبوون خوا بەهۆی منەوە رێنمایی کردن؟ پەراگەندە نەبوون، بەهۆی منەوە ئولفەت و هۆگری کردن؟ هەژارو دەسکورت نەبوون بەهۆی منەوە دۆڵەمەندو بێ نیازی کردن؟ هەر شتێکی گوتبا ئەنسار دەیانوت: منەت هەر لەبۆ خواو پێغەمبەرەکەیەتی ﴿[١٨] إن الله يعلم غيب السموات والأرض﴾ بەراستیی خوا تەواوی نادیارو پەنهانیەکانی ئاسمان و زەویی دەزانێت ﴿والله بصير بما تعملون﴾ وە خوا بینایە بەهەموو کاروکردەوەکانتان، هیچ شتێکی لاپەنهان و نادیار نیە، جا کەوابوو بەرێك و پێکی بڕوای راستەقینە بێنن.

کۆتایی تەفسیری سوورەتی (حوجورات).

*** *** ***

## ٥٠- سوورەتی ( قاف )ـە
## مەککەییەو ( ٤٥ ) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتە لەدوای سوورەتی (مورسەلات)ـەوە هاتووە، ئەمیش وەك سوورەتە مەککەییەکان باسی بناغەی عەقیدە: خوا بە یەکزانین، پەیام و بەرنامە، زیندوو بوونەوە، ئەکا، بەڵام تەوەرەی باسەکەی زیندوو بوونەوەیە، بەشێوەیەك خەریکە بڵێیت:باسی زیندوو بوونەوە بۆتە بەشێکی سەرەکیی سورەتەکە، ئەم سوورەتە سوورەتێکی زۆر توندە، بەقورسیی دائەبەزێتە سەرمەسەلەی پاداشت وتۆڵەو زیندوو بوونەوە، پەیامبەر ﷺ گەلێ جار لەرکاتی یەکەمی نوێژی بەیانی‌دا، وە لەرکاتی یەکەمی نوێژی جەژندا، وە لەهەموو رۆژێکی هەینیش لەسەر مینبەر ئەیخوێند، بۆیە (ئوممی هیشام) ئەڵێت: من هەر بەدەم پەیامبەرەوە ﷺ سورەتی (قاف)م لەبەرکرد (مسلم).



ئیمامی (إبن کسیر) ئەڵێ: قسەی راست ئەوەیە کە ئەم سوورەتە سەرەتای ئەو بەشە قورئانەیە کە ئایەتەکانی زۆر کورتن و پێی دەڵێن: (الحزب المفصل)، بەبەڵگەی ئەوە کە ئیمامی (ئەبی داود) لە (سنن)ی خۆیدا، لەبەشی (باب تحزب القران)دا ئاوا هێناویەتی، ئەوەتە (ئەوس) ئەڵێ: لەهاوەڵانیم پرسی: ئاخۆ چۆن قورئانتان بەش بەش دەکرد بۆ ئاسان خوێندنی و لەبەرکردنی؟ وتیان: سێ سوورەت، پێنج سوورەت، حەوت سوورەت، نۆ سوورەت، یازدە سوورەت، سێزدە سوورەت، ئەوجا (حزب المفصل) واتە: لەسوورەی (ق)یشەوە بۆ کۆتایی دەمانکردە حیزبێك. (ئەبوو داود). واتە: هەر سێ سوورە تەکەی پێشەوە: (البقرة، آل عمران، النساء) وە هەر پێنج سوورەتەکەی (مائیدة، ئە نعام، ئە عراف، ئە نفال، بە راءة). وە هەر حەوت سوورەتی: (یونس، هود، یوسف، الرعد، إبراهیم، الحجر، النحل) وە نۆ سوورەتی (سبحان، الکهف، مریم، طه، الأنبیاء، الحج، المؤمنون، النور، الفرقان). و یازدە سوورەتی: (الشعراء، النمل، القصص، العنکبوت، الروم، لقمان، السجدة، الأحزاب، سبأ فاطر، یس). وە سیانزە سوورەتی: (الصافات، ص، الزمر، غافیر، حم السجدة، حم عسق، الزخرف، الدخان، الجاثیة، الأحقاف، القتال، الفتح، الحجرات). لەپاشان لە (الحزب المفصل)ـەوە، واتە: لەسوورەتی (ق)ـەوە بۆ کۆتایی بەحیزبێکمان دادەنا.

### هاتنی پێغەمبەر و قیامەت لای خوانەناسان سەیرو سەمەرەیە :

﴿بسم الله الرحمن الرحیم * [1] ق﴾ ئەم پیتە هێمای موعجیزەی قورئانە، وەك پێیان بڵێ: دە فەرموون ئێوەش لەم پیتانە سوورەتێك بێنن کە لەهەموو روویەکەوە وەك قورئان وابێت ﴿والقرآن المجید﴾ سوێند بەم قورئانە بەرزو

بڵندو خاوەن شەرەفە ,ئێمە تۆمان نارد ئەی پێغەمبەر!ﷺ بۆئەوەی خەڵکی پێ ئاگادار بکەیتەوە, کەچی خەڵکی مەککە باوەڕیان نەهێنا! ﴿٢ بل عجبوا أنجاءهم منذر منهم﴾ کەچی هەر بەوەوە نەوەستان کەلە ئاستی قورئان بەدگومان و دوو دڵ بن، بەڵکو لەوە کەلە خۆیان ترسێنەرێکیان بە زیندووبوونەوەبۆ هاتووە سەرسامبوون! واتە: لەوە کە پێغەمبەر لە ئادەمزادە، نەك لە فریشتە ﴿فقال الكافرون هذا شئ عجيب﴾ئەوجا ئەوانە بێ بڕوابوون و وتیان: ئەمە(زیندووبوونەوە) شتێکی سەیرە! ﴿٣ إذا متنا وكنا ترابا﴾ ئایا کاتێ کە مردین و بووینە خاك و خۆڵ بۆجارێکی تر ئەگەڕێینەوە بۆحاڵەتی یەکەممان و زیندوو ئەبینەوە؟! ﴿ذلك رجع بعيد﴾دیارە ئەوگەڕانەوەیە ئەستەم و دوورە! ﴿٤ قد علمنا ما تنقص الأرض منهم﴾جا خوای گەورە بۆچوونەکانیان رەتدەکاتەوەو دەفەرمووێ: بێگومان ئێمەزوو زانیومانە زەوی چەندیان لێدەخوا و لێ کەم ئەکات،واتە: لە گۆشت و خوێن و ئێسك و.. پاشان دەبینەوە خۆڵ، تەنانەت هیچ شتێکیشمان لەوانە لێ بزر نابێت، ئیتر چۆن ناتوانین زیندوویان بکەینەوە؟! ﴿وعندنا كتاب حفيظ﴾ نامەیەکی پارێزەریشمان لایە بۆ هەڵژماردنی هەموو شتێك و لەکیس نەدانی هەر شتێك ﴿٥ بل كذبوا بالحق لما جاءهم﴾ نەك هەر ئەوەندە.. کە باوەڕ بە زیندوو بوونەوە نەکەن، بەڵکو هەر کەئەم قورئانە راستەشیان بۆ هات، هێمان هەر بڕوایان پێ نەهێنا ﴿فهم فى أمر مريج﴾ وجا ئەوان لەکارێکی قەلەقدان! جارێ گوتیان قورئان جادووە، جارێکیش گوتیان قورئان شیعرەو موحەممەدیش شاعیرەو.. هتد!

**ئەی بۆ ناڕواننە ئاسمان و زەویی و چیاکان ئیمان بێنن؟:**

﴿٦ أفلم ينظروا إلى السماء فوقهم﴾ ئایا بەبیرێکی وردەوە سەیری ئاسمانیان نەکردووە، لەلای سەرویانەوە﴿كيف بنيناها وزيناها﴾ و چۆن بینامان کردووە و، بەو هەموو ئەستێرانە رازاندوومانەتەوە ﴿وما لها من فروج﴾ و هیچ کەلێن و ناتەواوییەکیشی تێدا نیە؟ جا دەسەلاتدارێکی ئاوا چۆن ناتوانێ زیندوویان بکاتەوە؟ ﴿٧ والأرض مددناها﴾ زەویەشمان بە پان وبەرین راخستووە ﴿والقينا فيها رواسى﴾ و چەندین شاخ و کێوی قایممان وەك مێخ تێخستووە، تا لەنگەری بگرن ﴿وانبتنا فيها من كل زوج بهيج﴾ و لەهەر جووت و جۆرێکی جوان دیمەنمان گیاو رووەك تیا رواندووە, وەك لەسوورەتی تردا ئەفەرمووێ: (ومن كل شئ خلقنا زوجين لعلكم تذكرون) (٥٠/٤٩). بۆ هەمان مەبەست. ﴿٨ تبصرة وذكرى لكل عبد منيب﴾ بۆ پێدیتن ووەبیرهێنانەوە بۆ هەموو بەندەیەکی تەوبەکارو گەڕاوە بۆ لای خواﻟ ە ئەنجامی وردبوونەوە بیرکردنەوە لە نیشانەکانی خواﻟ ە بوونەوەردا ﴿٩ ونزلنا من السماء ماء مباركا﴾ و لە حەوایشەوە ئاوێکی بە بەرەکەتمان ناردەخوارەوە ﴿فأنبتنا به جنات وحب الحصيد﴾ ئینجا چەندین باخات و دانەوێڵەش کە دروێنە دەکرێت, وەك گەنم وجۆوبرنجمان پێ رواند ﴿١٠ والنخل باسقات﴾ وهەروەها دارخورمای بەرزو هەڵچووو ﴿لها طلع نضيد﴾ خاوەن بەر بەسەریەکداکەوتوو ﴿١١ رزقا للعباد﴾ بە رزق و رۆزیی بۆ بەندەکان ﴿واحيينا به بلدة ميتا﴾ و زەویەکی مردووشمان پێ زیندووکردەوە ﴿كذلك الخروج﴾ لە گۆڕ دەرچوونیش هەر ئاوایە ,واتە: هەرچۆنێ ئەو زەویە وشك و بێ گیانە ئەخەینەوەگەڕ, ئێوەیش زیندوو دەکەینەوە،وەکو دەفەرموێ: (لخلق السموات والارض اكبر من خلق الناس).یان دەفەرموێ: (أولم يروا أن الله الذى خلق السوات والأرض ولم يعى بخلقهن بقادر على أن يحيى الموتى بلى إنه على كل شى قدير) (٤٦/٣٣). واتە: بەدیهێنانی ئاسمانەکان وزەویی زۆر گەورە ترە لە بەدیهێنانی ئێوەی مەردم، جائیتر بۆ ئینکاری دروست کردنەوەیەکی نوێی خۆیان دەکەن؟!

**لە گەلانی پێشوو پەند وەرگرن:**

﴿١٢ كذبت قبلهم قوم نوح واصحاب الرس وثمود﴾ پێش ئەوانیش واتە: پێش (قورەیش) گەلی (نووح) کەلە عێراقدا بوون و ئەو گەلەیش کە بە دەوری بیری (رەس)دا کە لە ولاتی (یەمامە) دەژیان و (سەموودی) قەومی (صالح) ﴿١٣ وعاد وفرعون وإخوان لوط﴾ و گەلی (عاد)ی (قەومی هود) و (فیرعەون) و هۆزی لووت ﴿١٤ واصحاب الأيكة وقوم تبع﴾ و ئەصحابولئەیکەش - خاوەن بێشەکان و، گەلی (توببەع) کە لە ولاتی یەمەندا ئەژیان ﴿كل كذب الرسل﴾ ئەوانە هەموو پێغەمبەرەکانیان بەدرۆزن دانا و بڕوایان پێ نەکردن ﴿فحق وعيد﴾ جا هەڕەشەکەم بەدیهات، بۆ دابەزاندنی سزا بۆ سەریان ﴿١٥ افعيينا بالخلق الأول﴾ ئایا دورستکردنی یەکەم دەستەوسانی کردین، تا دووبارە دروستکردنەوە دەستەوسانمان بکات؟ ﴿بل هم فى لبس من خلق جديد﴾ نا، بەڵکو ئەوان سەبارەت بە دروست کردنەوەیەکی نوێ و تازە لە گوماندان، خوا لەسوورەتێکی تردا ئەفەرموێ: (وهو الذي يبدأ الحق ثم يعيده وهو أهون عليه). (٣٠/٢٧).. یان دەفەرموێ: (قل يحييها الذى أنشأها أول مرة وهو بكل خلق عليم)(٣٨/٧٩). واتە: هەر یەکەم بەدی هێنەر توانای ئەوەیشی هەیە کە ئێوە لەرۆژی دواییدا زیندوو بکاتەوە.

**خوا ئاگای لە خەیالاتیشمانە:**

﴿١٦ ولقد خلقنا الإنسان ونعلم ما توسوس به نفسه﴾ سوێند ئەخۆم کە ئادەمیمان دروستکردووە و بە وەسوەسەو خەیالاتی دڵیشی دەزانین ﴿ونحن اقرب إليه من حبل الوريد﴾ و ئێمەبۆ ئەو لەشادەماری راست و چەپی گەردنی کە ئەگەنەوە دڵی نزیکترین، مەبەست ئەوەیە کە خوا زانینی تەواوی بەهەموو جم وجوڵێکی ئادەمیی هەیە ﴿١٧ إذ يتلقى المتلقيان عن اليمين وعن الشمال قعيد﴾ کاتێ کە دووفریشتەکە کردەوەکانی وەردەگرن لەلای راست وچەپیەوە چاودێرن و دانیشتوون, واتە: یەکێکیان لەلای راستەوە دانیشتووەو ئەویشیان لەلای چەپەوە.

الجزء السادس والعشرون | سورة ق

وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ وَنَعْلَمُ مَا تُوَسْوِسُ بِهِۦ نَفْسُهُۥ ۖ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ
مِنْ حَبْلِ ٱلْوَرِيدِ ١٦ إِذْ يَتَلَقَّى ٱلْمُتَلَقِّيَانِ عَنِ ٱلْيَمِينِ وَعَنِ ٱلشِّمَالِ قَعِيدٌ
١٧ مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ ١٨ وَجَآءَتْ سَكْرَةُ
ٱلْمَوْتِ بِٱلْحَقِّ ۖ ذَٰلِكَ مَا كُنتَ مِنْهُ تَحِيدُ ١٩ وَنُفِخَ فِى ٱلصُّورِ ۚ ذَٰلِكَ
يَوْمُ ٱلْوَعِيدِ ٢٠ وَجَآءَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّعَهَا سَآئِقٌ وَشَهِيدٌ ٢١ لَّقَدْ
كُنتَ فِى غَفْلَةٍ مِّنْ هَٰذَا فَكَشَفْنَا عَنكَ غِطَآءَكَ فَبَصَرُكَ ٱلْيَوْمَ حَدِيدٌ
٢٢ وَقَالَ قَرِينُهُۥ هَٰذَا مَا لَدَىَّ عَتِيدٌ ٢٣ أَلْقِيَا فِى جَهَنَّمَ كُلَّ كَفَّارٍ
عَنِيدٍ ٢٤ مَّنَّاعٍ لِّلْخَيْرِ مُعْتَدٍ مُّرِيبٍ ٢٥ ٱلَّذِى جَعَلَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا
ءَاخَرَ فَأَلْقِيَاهُ فِى ٱلْعَذَابِ ٱلشَّدِيدِ ٢٦ ۞ قَالَ قَرِينُهُۥ رَبَّنَا مَآ أَطْغَيْتُهُۥ
وَلَٰكِن كَانَ فِى ضَلَٰلٍۭ بَعِيدٍ ٢٧ قَالَ لَا تَخْتَصِمُوا۟ لَدَىَّ وَقَدْ قَدَّمْتُ
إِلَيْكُم بِٱلْوَعِيدِ ٢٨ مَا يُبَدَّلُ ٱلْقَوْلُ لَدَىَّ وَمَآ أَنَا۠ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ٢٩
يَوْمَ نَقُولُ لِجَهَنَّمَ هَلِ ٱمْتَلَأْتِ وَتَقُولُ هَلْ مِن مَّزِيدٍ ٣٠ وَأُزْلِفَتِ
ٱلْجَنَّةُ لِلْمُتَّقِينَ غَيْرَ بَعِيدٍ ٣١ هَٰذَا مَا تُوعَدُونَ لِكُلِّ أَوَّابٍ حَفِيظٍ
٣٢ مَّنْ خَشِىَ ٱلرَّحْمَٰنَ بِٱلْغَيْبِ وَجَآءَ بِقَلْبٍ مُّنِيبٍ ٣٣ ٱدْخُلُوهَا
بِسَلَٰمٍ ۖ ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلْخُلُودِ ٣٤ لَهُم مَّا يَشَآءُونَ فِيهَا وَلَدَيْنَا مَزِيدٌ ٣٥

٥١٩

**بۆ گشت وتەیەك چاودێر هەیەو دەینووسێ:**

﴿١٨ ما يلفظ من قول إلا لديه رقيب عتيد﴾ هەر وتەیەکی لەدەم دەردەچێت، فریشتەی چاودێری ئامادە، لەلایەتی دەینووسێ.

ئایا فریشتەکان هەموو قسەیە دەنووسن؟ یا تەنها ئەو قسەیە دەنووسن کەپاداش و تۆڵەی هەیە؟ بەڵێ بەپێی ئایەتی: (ما يلفظ من قول إلا لديه رقيب عتيد) هەموو وتەو قسەیەك ئەنووسن.

(ئیبن عەباس) دەڵێ: لە سەرەتاوە هەموو خێرو شەرێکی ئادەمزاد -تەنانەتی وشەی خواردم، رۆیشتم- ئەنوسرێ، بۆ پاشان رۆژی پێنج شەممە، هەموو وتەو کردەوەیەکی دەنوێنرێ و (عەرز) ئەکرێ، ئەوجاهەر شتێ

چاك و خراپ بێت بۆی دەنوسرێ و، ئەوی دیكەی ئەسڕێتەوە، ئەوەیە كە خوا ئەفەرموێ: (یمحوا الله ما یشاء ویثبت وعنده أم الكتاب).

**بوورانەوەی گیانەلاّ لەسەرە مەرگدا:**

﴿[١٩] وجاءت سكرة الموت بالحق﴾ وا بێهۆشیی و، سەختیی و بوورانەوەی مرۆڤی گیانەلاّ پێش هات ﴿ذلك ما كنت منه تحید﴾ پێت ئەوترێ:ئەوەش ئەوەیە كەكاتی خۆی خۆتت لێ لادەداو نەتدەویست دووچاری بیت، دەئایا راست نیە؟. فتح الباری:٣٦٩/١١. ئەڵێ: كە پێغەمبەرﷺ كەوتە سەرەمەرگ و گیانەلاّ لەبەرسەختی و نارەحەتی گیانكێشان دەم وچاوی عەرەقی دەكردو دەیسڕیەوەدەیفەرموو: ((سبحان الله! إن للموت لسكرات)). واتە: بێخەوشیی هەر بۆخوایە، بەراستیی بۆمردن گەلێ حاڵەتی سەخت و قورس و گران هەیە. ﴿[٢٠] ونفخ فی الصور ذلك یوم الوعید﴾ فوو بە(صور)دا ئەكرێ بۆزیندووبوونەوەی خەڵك، ئەو نەفخەیە رۆژی پێشهاتنی ئەوهەڕەشەو بەڵێنانەیە،كاتی خۆی خوا لەبێ بڕواكانی دەكرد. لە فەرموودەدا هاتووە: ((كیف أنعم وصاحب القرن، قد إلتقم القرن وحنی جبهته، وإنتظر أن یؤذن له)). واتە: چۆن من دەتوانم خۆشحاڵ بم، لەحاڵێكدا شەیپووردار، شەیپورەكەی بە دەمەوەیەو، ئەوێڵ و ناچەوانیشی ئەوی كردووەو چاوەڕوانی فەرمانیخوایە؟ وتیان: ئەی ئێمەچی بڵێین لەكاتیئەوەدا؟ فەرمووی بڵێن: (حسبناالله ونعم الوكیل) ئەوانیش وتیان: (حسبناالله..) مسند إمام أحمد٣٢٦/١ وە(تحفه الأحوذی: ١١٧/٧. ﴿[٢١] وجاءت كل نفس معها سائق وشهید﴾ و ئەو رۆژە هەر كەسێك بۆ مەحشەردێ، دوو فریشتەی لەگەڵدایە، یەكێكیان پێش خۆی داوەو دەیگەیەنێتە مەحشەر، ئەوی دیكەشیان شایەدی دەدا لەسەری بەكردەوەكانی ﴿لقد كنت فی غفلة من هذا﴾ بەیەكەیەكەی بێباوەڕان دەڵێن: بێگومان تۆ لەدنیادا لەمە بێئاگاو غافڵ بوویت، پێت وانەبوو كە هەرگیز ئەم رۆژە دێت ﴿فكشفنا عنك غطاءك﴾ جاوا ئێستا پەردەكەتمان لادا،واتە: پەردەی غەفڵەت ﴿فبصرك الیوم حدید﴾ ئینجا ئەمرۆ بینایچاوت تێژە، ئەوەی جاران نەتدەبینی وائێستا دەیبینیت,مرۆڤی كافر لەوكاتەدا هەموو راستیەكان -وەك زیندووبوونەوە..هتد- كەلەدنیادا لێی پەنهانبوون, بەچاوی خۆی دەبینێ, پاشان چاوی شین دەبێ وبەكوێری حەشر دەكرێ.

**فریشتەكان شایەتی لە سەرمرۆڤەكان دەدەن:**

﴿[٢٣] وقال قرینه هذا مالدی عتید﴾ فریشتە هاوڕێ و هاونشینەكەی كە كردەوەكانی نووسیوە, لەلای خوا شایەدی دەداو ئەڵێ: پەروەردگاری من! ئەمە ئەوكردەوانەیە لەلای من ئامادەو گەلاّلە كراوە ﴿[٢٤] ألقیا فی جهنم كل كفار عنید﴾ پاشان خوا فەرمان بەو دوو فریشتەیە لەگەڵیدان ئەداوئەفەرموێ: ئادەی بهاوێژنە دۆزەخەوە هەموو كافرو بێبڕوایەكی سەركێش ﴿[٢٥] مناع للخیر﴾ رێگری خێر ﴿معتد مریب﴾ ستەمكاری بێگومان ﴿[٢٦] الذی جعل مع الله إلها آخر﴾ ئەوەیكە لەگەڵ خوادا پەرستنی كەسێكیتر بەڕەوا دەزانێ ﴿فألقیاه فی العذاب الشدید﴾ ئینجا هەرئێستا هەردووكتان بیهاوێنە ناو سزا سەختەكەوە(ئەبو سەعیدی خودریی) ئەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((یخرج عنق من النار یتكلم یقول وكلت الیوم بثلاثة: بكل جبار عنید، ومن جعل مع الله إلها آخر، ومن قتل نفسا بغیر نفس فتنطوی علیهم، فتقذفهم فی غمرات جهنم)) (مسند الإمام أحمد)(٤٠/٣).

لەناو دۆزەخدا سەرو ملێ دێتە دەرێو ئەڵێ: ئەمرۆ من چاودێریسێ كەسم: هەر دەسەلاّتدارێكی ستەمكار، هەركەسێك شەریك و هاوبەشی بۆ خوا دانابێت، هەر كەسێ بێ تاوان كەسێكی دی كوشتبێ، ئەوجا پەلاماریان ئەداتێ و، توڕیان هەڵدەدا بۆ نێو دڵی دۆزەخ ﴿[٢٧] قال قرینه ربنا ما أطغیته﴾هاوڕێ و هاونشینە شەیتانەكەی،

پاکانە بۆخۆی دەکاو دەڵێ: ئەی پەروەردگارمان! من بێ بڕواو گومڕام نەکرد ﴿ولكن كان فى ضلال بعيد﴾ بەڵکو ئەو خۆی لەناو گومڕاییەکی دوور لە هیدایەتدا بوو﴿[٢٨] قال لا تختصموا لدى﴾ پاش ئەو شەڕە دەمە، خوا ئەفەرمووێ:لای من هیچ شەڕە دەم مەکەن ﴿وقد قدمت إليكم بالوعيد﴾ چونکە کاتی خۆی لەسەر زمانی پەیامبەرەکانم،هەڕەشەی ئەم ڕۆژەم لیکردن، هەموو شتێکم بۆ روون کردنەوەئیتر ئێستا جێی قسەتان نەماوە ﴿[٢٩] ما يبدل القول لدى﴾ بڕیارو قسە ی من بۆ سزادانتان ناگۆڕێ ﴿وما انا بظلام للعبيد﴾ ومن ناحەقیی و ستەمیش لەبەندەکان ناکەم.

## جەهەننەم بە هیچ پڕ نابێ:

﴿[٣٠] يوم نقول لجهنم هل امتلأت﴾ ئەو ڕۆژە وەبیربێنە کە بە دۆزەخ ئەڵێین: ئایا پڕبووی؟ لەو هەموو خەڵکەی پۆل پۆل بۆتی ئەنێرین؟ ﴿وتقول هل من مزيد﴾ ئەویش ئەڵێ: ئاخۆ زیاتریش هەیە؟. لە فەرموودەیەکی (قودسی)دا هاتووە کە پێشەوا (بوخاریی و موسلیم)١٢٨٧/٤١. هێناویانە: ((لا تزال جهنم يلقى فيها وتقول: هل من مزيد؟ حتى يضع رب العزة فيها قدمه فتقول: قط. قط، وعزتك وكرمك —اى كفى كفى —فينزوى بعضها إلى بعض..)).بەڵێ، بڕوامان بەصیفەتی (قەدەم) وەك لە فەرموودەکاندا هاتووە هەیەو دەسکاریشی ناکەین، بەڵام شێوەو چۆنیەتیەکەی دەگێڕینەوە لای خوا. ئیمامی (ئیبن کەسیر) کەدەگاتە تەفسیری ئایەتی: (يوم نقول لجهنم هل امتلأت..) دەڵێ: لەبەرئەوەکە خوا بەڵێنی داوە دۆزەخ بەمرۆۋ و جنۆکە پڕ بکا، ڕۆژی قیامەت پێی دەڵێت:ئاخۆ پڕ بوویت؟ پاشان، ئەوی تێچوو توورِ هەڵدرایە نێویەوە هێشتا هەر دەڵێ: ئاخۆ زیاتر هەیە..؟ جا لەو کاتەدا هەر پڕ نابێ و داوای هی، تری لێ دەکات، ئەوجا خوا (پێی) پیرۆزی خۆی دەخاتە نێویەوە، ئەوسا لە هەیبەتی ئەودا،دەچێتە وە یەك و، دەڵێ: (قط قط). واتە: خوایە! بەسمە، بەسمە، پڕ بووم و جێی کەسم نەماوە. زانایان دەڵێن: ئەو قسەی دۆزەخە ڕاستەو هەقیقەتی هەیەو، خوا دەیهێنێتە گۆو قسە, بۆیە خوا پێی پیرۆزی خۆی تێدەخا، چونکە لەوپەڕی قوڵی و، فراوانیدایە، ئیتر بەو شێوەیە لەملاو لەولاوە دێتەوەیەك وبچووك دەبێتەوە. ئیمامی (بوخاریی)و ئیمامی، (مسلم)وپێشەوا (ئەحمەد)یش هەمان راو بۆچوونیان هەیەو، هەریەکەشیان فەرموودەیەکی هێناوە ئاشکرایشە کا، (قەدەم، ریجل) هەردووك یەك شتە. جا کەوایە (قەدەم) سیفەتێکی زاتیی خوایە، بەڵام دیارە ئەو قەدەمە وەك، قەدەمی دروست کراوەکانی نیيە. (دارەمیی)لە(ئیبن عەباس)وە دەڵێ: ((الكرسى موضع القدمين، والعرش لا يقدر قدره إلا الله)) حاکمیش لە(المستدرك)دا هێناویەتیو دەڵێ: (صحيح على شرط الشيخين ووافقه الذهبى وابن جرير). ﴿[٣١] وازلفت الجنة للمتقين غير بعيد﴾ بەهەشتیش بۆ پارێزکاران , ئەوانەی وا سنووری خوا ئەپارێزن , نزیك، دەخرێتەوەوهێندەدوورنیە لێیانەوە، زۆری نامێنێ پێیبگەن ﴿[٣٢] هذا ماتوعدون لكل أواب حفيظ﴾ پێیان ئەوترێ: ئەمە بۆ هەرکەسێك روو بەخوابێ و بۆلای ئەو بگەڕێتەوە و سنوورەکانیئەو بپارێزێ ﴿[٣٣] من خشى الرحمن بالغيب وجاء بقلب منيب﴾ بۆئەوەی هەردەم لەخوای بەخشندەی خۆی ترساوە لەپەنهاندا، بەدڵێکی گەڕاوە بۆلای خوا هاتووە، وەك ئەوفەرموودەیە دەفەرموێ: ((..ورجل ذكر الله خاليا ففاضت عيناه..))متفق عليه. واتە: یەکێ دیکە لەو حەوت کەسە لەڕۆژی دواییدا لەبن سێبەری خوادا حەشر دەکرێن، ئەو مرۆڤەیە کە بەنهێنی و، لە چۆڵەوانیا هەردەم یادی خوا دە کاو، چاوەکانی فرمێسکیان پیا دێتە خوار ﴿[٣٤] ادخلوها بسلام ذلك يوم الخلود﴾ پێیان ئەوترێ فەرموون:هەموو بە ئاسوودەیی و ئارامیەوە بچنە ناو بەهەشتەوە، ئەوە ڕۆژی هەتا هەتایی و نەمرییە ﴿[٣٥] لهم ما يشاءون فيها﴾ حەزیشیان لە هەرچی بێت بۆیان هەیە داوای بکەن ,لەفەرموودەدا هەیە کە ئەگەر بەهەشتیان

حەزیان لەگۆشتی برژاوی باڵندە بێ، زوو دەهێنرێتە بەردەستیان (ئیبن ئەبوو حاتەم)، خۆ ئەگەر حەزیان لەمنداڵ و زارۆڵەش بێت، ئەوا لەیەك ساتدا لەدایك دەبێ.. (ئەحمەد، ئیبن ماجە، ترمذی). ﴿ولدینا مزید﴾ وەزیادەش لەوە کە بەخەیاڵی هیچ کەسێکدا نایەت ,لامان هەیە. ئەو زیادەیەش - وەك (موسلیم) دەڵێ- سەیرووتەماشای دیمەن و روخساری پیرۆزی خوای پەروەردگار ە-جل جلالە-, وە ئایەتی: (للذین احسنوا الحسنی وزیادة)(١٠/٢٦). بۆ دوپاتی سەیرو تەماشای روخساری خوایە، جگە لەوەش تەنانەت هەموو رۆژێکی هەینیی، خوای پەروەردگار خۆی بۆبەهەشتیان دەردەخات (بەزار، ئیبن ئەبوو حاتم، ئیمامی شافعی) ریوایەتیان کردووە.

**بەرلەقورەیش گەلانی زۆرمان قڕ تێخستن:**

﴿[٣٦] وکم أهلکنا قبلهم من قرن﴾ وەبەر لەقورەیش ,خەڵێکی زۆرمان لەناو برد و تۆڵەمان لێکردنەوە ﴿هم اشد منهم بطشا﴾ ئەوانیش بەهەڵمەت تر وبە هێز تر بوون لەوان ﴿فنقبوا فی البلاد﴾ وڵات وشاری زۆریان پشکنی و گەڕان، واتە: بۆ رابواردن و رزق و رۆزی بەدەست هێنان و ئەملاو ئەوکردن ﴿هل من محیص﴾ ئایا هیچ لدلادانێك هەبوو بۆیان لەتیاچوون، تاخۆیانی تیا بشارنەوە لە سزاو لە مردن؟ ﴿[٣٧] إن فی ذلك لذکری لمن کان لە قلب أو ألقی السمع وهو شهید﴾ بێگومان لەو سەرگوزەشتەی پێشینانەدا, ئامۆژگاری هەیە بۆ ئەوەی دڵ وژیری هەیە, یان بەباشی گوێراگریێ وئامادەش بێت دڵ وگوێی بداتێ ﴿[٣٨] ولقد خلقنا السموات والأرض وما بینهما فی ستة أیام﴾ سوێند بەخوا ئاسمانەکان و زەوی و، هەرچی لەنێوانیاندا هەیە، لەماوەی شەش رۆژاندا دروستمانکردوون ﴿ومامسنا من لغوب﴾ لەگەڵ ئەوەشدا هیچ جۆرە ماندوو بوونێکیشمان تووش نەهات ﴿[٣٩] فاصبر علی ما یقولون﴾ سا لەئاست ئەو هەموو قسەو قسەڵۆکانەیاندا ددان بەخۆتا بگرە و ئارامت ببێ ﴿وسبح بحمد ربك قبل طلوع الشمس وقبل الغروب﴾ و بۆبەرگرتن لەو هەموو ناسۆرانە بەردەوام خوای خۆت لەهەر شتێك بۆ ئەو ناتەواو بێت بەخاوێن رابگرە، لە پێش خۆر هەڵاتن ولە پێش خۆر ئاوابوون ,واتە:بەیانیان و عەسران، چونکە پاداشی ئەو دووانە زۆر زۆرە ﴿[٤٠] ومن اللیل فسبحه وأدبار السجود﴾ جالەشەویشدا خوای خۆت بەپاك رابگرە و، لەپاش سوژدەی هەموونوێژەکانیش.(ئیبن عەباس) دەڵێ: مەبەست بەویادە تەسبیحاتی دوای نوێژەکانە. (ئیبن کەسیر) ئەڵێت: پێش شەو رەویی لەشەوو رۆژێکدا دوو نوێژ فەرزبوو(بەیانی وعەسر) شەو نوێژیش ماوەی ساڵێك لەسەر خۆی وئوممەتەکەی فەرز بوو، پاشان لەسەر ئوممەتەکەی سڕایەوە، ئینجا بۆ ماوەیەکی تریش بەشەورەویەکەی هەموو سڕایەوەو نوێژ بوویە پێنج فەرز.

الجزء السادس والعشرون — سورة ق

وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّن قَرْنٍ هُمْ أَشَدُّ مِنْهُم بَطْشًا فَنَقَّبُوا فِي
الْبِلَادِ هَلْ مِن مَّحِيصٍ ﴿٣٦﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِمَن كَانَ
لَهُ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَى السَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ ﴿٣٧﴾ وَلَقَدْ خَلَقْنَا
السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ وَمَا مَسَّنَا
مِن لُّغُوبٍ ﴿٣٨﴾ فَاصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ
قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ الْغُرُوبِ ﴿٣٩﴾ وَمِنَ اللَّيْلِ فَسَبِّحْهُ
وَأَدْبَارَ السُّجُودِ ﴿٤٠﴾ وَاسْتَمِعْ يَوْمَ يُنَادِ الْمُنَادِ مِن مَّكَانٍ قَرِيبٍ
﴿٤١﴾ يَوْمَ يَسْمَعُونَ الصَّيْحَةَ بِالْحَقِّ ذَٰلِكَ يَوْمُ الْخُرُوجِ ﴿٤٢﴾ إِنَّا
نَحْنُ نُحْيِي وَنُمِيتُ وَإِلَيْنَا الْمَصِيرُ ﴿٤٣﴾ يَوْمَ تَشَقَّقُ الْأَرْضُ
عَنْهُمْ سِرَاعًا ذَٰلِكَ حَشْرٌ عَلَيْنَا يَسِيرٌ ﴿٤٤﴾ نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ
وَمَا أَنتَ عَلَيْهِم بِجَبَّارٍ فَذَكِّرْ بِالْقُرْآنِ مَن يَخَافُ وَعِيدِ ﴿٤٥﴾

سُورَةُ الذَّارِيَاتِ

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

وَالذَّارِيَاتِ ذَرْوًا ﴿١﴾ فَالْحَامِلَاتِ وِقْرًا ﴿٢﴾ فَالْجَارِيَاتِ يُسْرًا ﴿٣﴾
فَالْمُقَسِّمَاتِ أَمْرًا ﴿٤﴾ إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَصَادِقٌ ﴿٥﴾ وَإِنَّ الدِّينَ لَوَاقِعٌ ﴿٦﴾

وَالسَّمَاءِ ذَاتِ ٥٢٠

**ڕووداوەکانی ڕۆژی پەسڵان:**

﴿[٤١] واستمع یوم یناد المناد من مکان قریب﴾ گوێڕاگرە ئەی پێغەمبەر! بۆ ئەو هەواڵەی پێت دەدەین لە ئەحواڵی‌قیامەت ،ڕۆژێك (ئیسرافیل)بانگ دەکا لە شوێنێکی‌نزیك بەخەڵك هەمووتان دەرچن لە گۆڕەکانتان بۆ حەشر ﴿[٤٢] یوم یسمعون الصیحة بالحق﴾ ئەو ڕۆژە کە هەموو ئەو (صیحة)و هاوارەیان بە هەق گوێ لێدەبێ ﴿ذلك یوم الخروج﴾ ئائەو ڕۆژە، ڕۆژی لەگۆڕ دەرچوونە بۆ حەشرو پاداش و تۆڵە ﴿[٤٣] إنا نحن نحیی ونمیت وإلینا المصیر﴾ بەڕاستیی هەر ئێمەین ژیان دەبەخشین و دەشمەرێنین، وەگەڕانەوەش هەر بۆلای ئێمەیەدوای زیندووبوونەوە، ﴿[٤٤] یوم تشقق الأرض عنهم سراعا﴾ ڕۆژێ زەوی لەڕووی ئەوانەدا لەت لەت ئەبێ ودەقڵیشێتەوە، ئینجا خەڵکیش بە پەلە لە گۆڕەکانیاندا دەر ئەچن بۆ مەحشەر ﴿ذلك حشر علینا یسیر﴾ ئەوکارەش کۆکردنەوەو حەشریچکە لە سەر ئێمە ئاسانە ﴿[٤٥] نحن أعلم بما یقولون﴾ ئێمە زاناترین بەوەی ئەوان ئەیڵێن بەرامبەر بە خۆت وبە پەیامەکەت ﴿وما انت علیهم بجبار﴾ وە تۆش زاڵ و زۆردارێك نیت بەسەریاندا و فەرمانت پێ نەکراوە کە بەزۆر ئیمانیان پێ بێنیت ﴿فذکر بالقرآن من یخاف وعید﴾ دەسا هەرکەسێك لەهەڕەشەو بەڵێنەکانی من ئەترسێت،تۆ بەم قورئانە ئامۆژگاری بکەو، دیارە مەگەر کەسێکیش ئامۆژگاری وەربگرێ، لەخوای خۆی بترسێت.

زۆرسوپاس بۆخوا، لەشەوی (٣/٢)ی شەعبانی (١٤١٧) بەرامبەربە (١٩٩٦/١٢/١٣/١٢) لەنووسینی ئەم سوورەتە پڕ لەترسە بوومەوە لەهەڵەبجە،(لەڕاگەیاندنی بزووتنەوەی ئیسلامیی) پاش نوێژی شێوان.

*** *** ***

## ٥١- سوورەتی (زاریات) لە مەککەییەو (٦٠) ئایەتە

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

ئەم سوورەتە وەك هاو وێنەکانی دیکەی باسی بنەماکانی ئیمان و بڕوا: یەکخواپەرستیی، پەیام، زیندوو بوونەوەو پاداش و تۆڵە دەکا. لەسەرەتاوە باسێکی(با)کان ئەکات، ئینجا هەورەکان، ئەوسا ئەوکەشتییە گەورانەی بەناو دەریاکاندا دێن و ئەڕۆن، ئەو فریشتانەی کاروباری خەڵکییان پێ سپێردراوە، خوا سوێندیان پێ ئەخوات کە بێگومان حەشر دێت وپاداش و تۆڵەیش بە دوایا دێ، باسی ئەوانەی بڕوایان بە قورئان نەبوو، ئەنجامیان لە دونیاو قیامەتدا، بڕوادارانی پارێزگار و ئەو نازو نیعمەتەی بۆیان ئامادە کراوە لەبەهەشتدا. دەسەڵاتی خوا لەم بوونەوەرەدا: لەئاسمان و زەویی‌و کێوەکان و مرۆڤەکان.. داستانی هەندێ لەپەیامبەران، هەڵوێستی تاغووتەکان لەگەڵ پیاوانی خواداو ئەنجامیان.. مەبەست لە دروستکردنی ئادەمی و جنییدا.

**دووپاتکردنەوەی هاتنی ڕۆژی جەزاو تۆڵە:**

﴿بسم الله الرحمن الرحیم * [١] والذاریات ذروا﴾ سوێند بەو (با)یانەی تۆزو پووش و تۆوی گیاکان بڵاودەکەنەوە بە بڵاوکردنەوە, لەملا دەیبەن بۆ ئەولا ﴿[٢] فالحاملات وقرا﴾، سوێندیش بەو (با)یانە لە گەڵ خۆیان ئاوی باران هەڵدەگرن ﴿[٣] فالجاریات یسرا﴾ سوێند بەو گەمیانەش بەئاسمانی لەنێو دەریاکاندا دێن و دەچن. ﴿[٤] فالمقسمات أمرا﴾ پاشان بەو فریشتانە کەکاروبار لەناو بوونەوەردا(ڕزق و ڕۆزیی‌و..) دابەش ئەکەن, دیارە فریشتەکان هەر کۆمەڵەیان کارێکیان پێ سپێردراوەو لە سنووری خۆیاندا پێی هەڵدەسن ﴿[٥] إنما توعدون لصادق﴾

بە هەموو ئەوانە، هەر هەڕەشەیەك لێتان دەكرێ و هەر بەڵێنێك پێتان دەدرێ لەژیانەوە، دێتەجێ، بەڵێ.. بۆیە خوای گەورە سوێند بەوانە ئەخوات، چونكە جێگەی بیركردنەوەن بۆ دۆزینەوەی خوای بالادەست ﴿٦ وإن الدين لواقع﴾ و بێگومان پاداش و تۆڵە، هەر دێتە جێ و بەڕێوەیە ﴿٧ والسماء ذات الحبك﴾ سوێند بەو ئاسمانە كە ڕێ ڕێیەو، زۆریش بەجوانییەو، ڕێك و پێك، ئەستێرەكان بەناویاندا دێن و ئەڕۆن ﴿٨ إنكم لفى قول مختلف﴾ بێگومان ئێوە ئەی بێبڕوایانی قورەیش! وتەو گوفتارتان سەبارەت بە پێغەمبەر ﷺ جیاوازو بێ سەروبەرەوە دوورە لە ڕاستیی، كە جارێ ئەڵێن: جادووگەرە، جارێكیتر ئەڵێن شاعیرەو.. هتد ﴿٩ يؤفك عنه من افك﴾ لە قورئان و لە پەیامبەر كلا دەكرێ ،ئەو كەسەی لەزانینی خوادا لادراوە، چونكە خوا خۆی زانیویەتی كە ئەو جۆرە كەسە زۆر لارو لاسارەو بەكەڵكی هیدایە تدان نایە ﴿١٠ قتل الخراصون﴾ بەكوشت چن و بمرن بوختانچیەكان،ئەوانەی كە ئەو درۆوپڕوو پالأنتانە بۆ پەیامبەر ئەكەن، وەك لە جێگایەكی تردا دەفەرموێت: (قتل الإنسان ما أكفره) (١٧/٨٠). ﴿١١ الذين هم فى غمرة ساهون﴾ ئەو كەسانەی كەبە نەزانی خۆیان لە ناو گێژاوی گومراییو تاریكیدا ڕۆچوون و غافڵ و بێ ئاگان ﴿١٢ يسألون أيان يوم الدين﴾ بەگاڵتەوە ئەپرسن:ئەرێ ڕۆژی ڕەستاخێز، ڕۆژی پاداشت و تۆڵە، كەی دێ؟! ﴿١٣ يوم هم على النار يفتنون﴾ ئەوڕۆژەی ئەوان لەناوئاگردا سزا ئەدرێن ﴿١٤ ذوقوا فتنتكم﴾ پێیان ئەوترێ: سزاكەتان بچێژن ﴿هذا الذى كنتم به تستعجلون﴾ ئەمە ئەو سزایی بوو لە دونیادا پەلەتان بۆ ئەكرد، بەگاڵتەوە ئەتان وت: كەی دێت؟!



وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الْحُبُكِ ﴿٧﴾ إِنَّكُمْ لَفِي قَوْلٍ مُخْتَلِفٍ ﴿٨﴾ يُؤْفَكُ عَنْهُ مَنْ أُفِكَ ﴿٩﴾ قُتِلَ الْخَرَّاصُونَ ﴿١٠﴾ الَّذِينَ هُمْ فِي غَمْرَةٍ سَاهُونَ ﴿١١﴾ يَسْأَلُونَ أَيَّانَ يَوْمُ الدِّينِ ﴿١٢﴾ يَوْمَ هُمْ عَلَى النَّارِ يُفْتَنُونَ ﴿١٣﴾ ذُوقُوا فِتْنَتَكُمْ هَٰذَا الَّذِي كُنْتُمْ بِهِ تَسْتَعْجِلُونَ ﴿١٤﴾ إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٥﴾ آخِذِينَ مَا آتَاهُمْ رَبُّهُمْ إِنَّهُمْ كَانُوا قَبْلَ ذَٰلِكَ مُحْسِنِينَ ﴿١٦﴾ كَانُوا قَلِيلًا مِنَ اللَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ ﴿١٧﴾ وَبِالْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴿١٨﴾ وَفِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ لِلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ ﴿١٩﴾ وَفِي الْأَرْضِ آيَاتٌ لِلْمُوقِنِينَ ﴿٢٠﴾ وَفِي أَنْفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٢١﴾ وَفِي السَّمَاءِ رِزْقُكُمْ وَمَا تُوعَدُونَ ﴿٢٢﴾ فَوَرَبِّ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ إِنَّهُ لَحَقٌّ مِثْلَ مَا أَنَّكُمْ تَنْطِقُونَ ﴿٢٣﴾ هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ ضَيْفِ إِبْرَاهِيمَ الْمُكْرَمِينَ ﴿٢٤﴾ إِذْ دَخَلُوا عَلَيْهِ فَقَالُوا سَلَامًا قَالَ سَلَامٌ قَوْمٌ مُنْكَرُونَ ﴿٢٥﴾ فَرَاغَ إِلَىٰ أَهْلِهِ فَجَاءَ بِعِجْلٍ سَمِينٍ ﴿٢٦﴾ فَقَرَّبَهُ إِلَيْهِمْ قَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ ﴿٢٧﴾ فَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً قَالُوا لَا تَخَفْ وَبَشَّرُوهُ بِغُلَامٍ عَلِيمٍ ﴿٢٨﴾ فَأَقْبَلَتِ امْرَأَتُهُ فِي صَرَّةٍ فَصَكَّتْ وَجْهَهَا وَقَالَتْ عَجُوزٌ عَقِيمٌ ﴿٢٩﴾ قَالُوا كَذَٰلِكِ قَالَ رَبُّكِ إِنَّهُ هُوَ الْحَكِيمُ الْعَلِيمُ ﴿٣٠﴾



### سیفاتی پارێزگاران و جێگەو شوێنیان:

﴿١٥ إن المتقين فى جنات و عيون﴾ بێگومان خۆ پارێزانیش لەشیرك و سەرپێچی، لەنێو چەندین باخات و، لەپاڵ چەند سەرچاوەی ئاودان ﴿١٦ آخذين ماآتاهم ربهم﴾ هەرچی پەروەردگاریان لەپاداشتی كارەكانیاندا بۆیداناون، لەبەهەشتدا وەریدەگرن ﴿إنهم كانوا قبل ذلك محسنين﴾ چونكە ئەوانە پێش ئەمڕۆ هەر لەدونیادا ئاكار چاك بوون. وەكو لە جێگایەكی تردا ئەفەرموێ: (كلوا واشربوا هنيئابما اسلفتم في الأيام الخالية)(٦٩/٢٤). ﴿١٧ كانوا قليلا من اليل مايهجعون﴾ كەمێك لەشەو ئەخەوتن، زۆربەی شەونوێژیان ئەكرد. (عەبدو ڵلای كوڕی عومەر) دەڵێ: پێغەمبەر فەرمووی: (إن فى الجنة غرفا يرى ظاهرها من باطنها، وباطنها من ظاهرها). واتە: لەبەهەشتدا چەند كۆشك و تەلارێك هەیە، دیوی دەرەوەیان ,لە ناوەوەیان دەبینرێ، جا دەپرسن: ئەوانە بۆ كی دەبن؟ فەرمووی: ((لمن الان الكلام، وأطعم الطعام، وبات لله قائما والناس نيام)). ئیمام ئەحمەد هێناویە. ٢/١٧٣. بۆ ئەوانە یە: قسەیان خۆشە، هەردەم بەنەرم ونیان قسە دەكەن، خۆراك و خواردن دەبەخشن،كاتێكیش خەڵك خەوتوون، ئەوان بەپێوەن و خەریكی شەو نوێژن ﴿١٨ وبالأسحار هم

يستغفرون﴾ هێمان لەبەرەبەیاندا، لەخوا داوای خۆشبوون دەکەن, وەك ئەوە کە شەو هەر خەریکی گوناح و تاوان بووبن! ﴿[١٩] وفي أموالهم حق للسائل والمحروم﴾ و بیّ لە وجاڵەشیان هەمیشە لە ماڵ و سامانیاندا بەشێکی دیاریی و بەرچاو، بۆ ئەوکەسە داوا ئەکاهەبوو، وەك پێغەمبەر ئەفەرمووێ: ((للسائل حق وإن جاء على فرس)) پێشەوا ئەحمەد. واتە: سواڵکەریش مافی هەیە، ئەگەرچی بەسواری ئەسپیش بیّ و داوابکا، وەهەروا بەش ئەو کەسەیش دەدەن کەخۆی نیەتیو، داوا لە خەڵك ناکات ,وەك ئەوە کە سامانەکەیان لە ژێر دەستی هەژاراندا بێت.

## نیشانەگەلیّ بۆ دۆزینەوەی خوا:

﴿[٢٠] وفي الأرض آيات للموقنين﴾ وە لەزەوییدا گەلیّ نیشانەو بەڵگەی گەورەومەزن هەیە بۆئەوانەی لە ئیمان و لەبڕوادا بێگومانن، چونکە سەیری ئەو هەموو جۆرە گیاو گوڵ و ئاژەڵ و کێوو شاخ و چیاو دەشت و دەرە ئەکەن، دەرئەنجام بەو شێوەیەش بۆخوا ملکەچ ئەبن ﴿[٢١] وفي انفسكم﴾ وە لەخودی خۆیشتاندا بەڵگە گەلیّهەیە بۆ دۆزینەوەی خوا ﴿أفلا تبصرون﴾ دەسا لە خۆتان ناڕوانن و تەماشا ناکەن؟ سەیر ناکەن خوای گەورەچۆن ئێوەی دروست کردووە، هەریەکە شێوەی ئاخافتن و زمانی جۆرێکە، رەنگ و روخساری جۆرێکە، پلەی ژیریی و تێگەیشتنی و بەژن و بالاّوقەدو قامەت و..هتد ﴿[٢٢] وفي السماء رزقكم﴾ ورزق و رۆزیتان هەر لە ئاسمانە، واتە:هۆی ژیان و ژیوارتان لەوێوەیە، لەوێوە بارانتان بۆ دێت ﴿وما توعدون﴾ وەهەر چیش بەڵێنتان پیّ ئەدریّ لەخێرو لەشەڕ هەر لەئاسمانە ,بەتایبەت بەهەشت ﴿[٢٣] فورب السماء والأرض إنه لحق مثل ما انكم تنطقون﴾ سا سوێند بەپەروەردگاری ئاسمان و زەویی، ئەم بەڵێنە بەرزق و رۆزیی،و، زیندووبوونەوەو پاداشت و تۆڵە راست و رەوایە، وەك ئەوەی ئێوە قسە ئەکەن.

## میوانەکانی ئیبراهیم ﷺ:

﴿[٢٤] هل أتاك حديث ضيف إبراهيم المكرمين﴾ ئاخۆ هەواڵی میوانە بەڕێزەکانی ئیبراهیمت بۆ هاتووە؟ ﴿[٢٥] إذ دخلوا عليه فقالوا سلاما﴾ کاتیّ چوونە ژوور لای بۆ لەناوبردنی گەلەکەی لووط، جا گوتیان: سەلامت لیّ بێت ئیبراهیم! ﴿قال سلام﴾ ئیبراهیمیش وتی: سەلام لەئێوەیش بێت ﴿قوم منكرون﴾ ئێوە لای من خەڵکێکی نەناسراون, ناتانناسم، نازانم ئێوە کێن؟ ﴿[٢٦] فراغ إلى اهله﴾ ئینجا زۆر بیّ چرپە وبە پەلە -هەتامیوانەکان پێی نەزانن- چوو بۆ لای هاوسەرەکەی ﴿فجاء بعجل سمين﴾ نەیزانی فریشتەن ,جا گوێرەکەیەکی قەڵەوی برژاوی بۆ هێنان ﴿[٢٧] فقربه إليهم﴾ نزیکی خستەوە بۆیان،بەلاّم دەستیان بۆ نەبرد! ﴿قال الا تأكلون﴾ وتی ئایا ناخۆن؟! پێشەوا (ئەحمەد) دەڵیّ: میوانداری و ڕێز نان لەمیوان، واجبێکی ئیسلامییە، هەر کەسیّ ڕێی کەوتە لای هەر کەسیّ، دەبیّ خواردنی گونجاو وشیاوی بداتیّ. ﴿[٢٨] فأوجس منهم خيفه﴾ ئینجا کە دیتی خواردنە کە ناخۆن، پێی وابوو پیاو خراپن، بۆیە لە دلاّ ترسێکی لیّ نیشت، وەکو لە جێگایەکیتردا دەفەرمویّ: (فلما رأى أيديهم لا تصل إليه نكرهم وأوجس منهم خيفة)(١١/٧٠). ﴿قالوا لا تخف﴾ ئەوانیش وتیان: تۆ مەترسە، چونکە ئێمە فریشتەو نێرراوی خواین ﴿وبشروه بغلام عليم﴾ جگە لەو کارە شیان بۆی هاتبوون، بە بوونی کوڕێکی زانا لەخاتوونە(سارە) موژدەیان دایەو ناوی (ئیسحاق) ی لیّ نرا ﴿[٢٩] فاقبلت امراته في صرة﴾ ئینجا ژنەکەی بە دەنگە دەنگ و,بە هاوار هاوارەوەهاتە پێشیّ ﴿فصكت وجهها﴾ جا چەموڵەیەکی لە رووەمەتی خۆیدا، وەك باوی ژنان، کاتیّ کە شتیّ جێی سەر سوڕمان بێت بیبیستن وادەکەن ﴿وقالت عجوز عقيم﴾ وتی: ئەیرۆ! منداڵی چی؟ خۆ من پیرەژنێکم بیّ زك و زا؟! ﴿[٣٠] قالوا كذلك قال ربك﴾ وتیان: پەروەردگاری تۆ ئاوای فەرمووەو وای بڕیار داوە، جاکەوایە سەرت

سورنەمێنیٚ لە تواناودەسەڵاتی خوا ﴿إنه هو الحكيم العليم﴾ چونکە بەراستی ئەوخۆیەتی خاوەن حیکمەتی زانا, بە قازانج وبەرژەوەندیی بەندەکانی زانایە، بۆیە لەوتەمەنەشدا منداڵیان ئەداتیٚ.

دوای نوێژی خەوتنان کۆتایی جزمی (٢٦) هات, لە (٥/٤) شەعبان (١٤١٧)ك, بەرامبەر بە (١٤/١٢/١٥/١٩٩٦)، لەڕاگەیاندنی بزووتنەوەی ئیسلامیی لەکوردستان/عێراق، لە هەڵەبجەی زامدار.

**کۆتایی جزمی بیست و شەشەم**

**و لله الحمد و المنة.**

*** *** ***

سُورَةُ الذَّارِيَات — الجزء السابع والعشرون

قَالَ فَمَا خَطْبُكُمْ أَيُّهَا الْمُرْسَلُونَ ﴿٣١﴾ قَالُوا إِنَّا أُرْسِلْنَا إِلَىٰ قَوْمٍ
مُّجْرِمِينَ ﴿٣٢﴾ لِنُرْسِلَ عَلَيْهِمْ حِجَارَةً مِّن طِينٍ ﴿٣٣﴾ مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ
لِلْمُسْرِفِينَ ﴿٣٤﴾ فَأَخْرَجْنَا مَن كَانَ فِيهَا مِنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴿٣٥﴾ فَمَا وَجَدْنَا
فِيهَا غَيْرَ بَيْتٍ مِّنَ الْمُسْلِمِينَ ﴿٣٦﴾ وَتَرَكْنَا فِيهَا آيَةً لِّلَّذِينَ يَخَافُونَ
الْعَذَابَ الْأَلِيمَ ﴿٣٧﴾ وَفِي مُوسَىٰ إِذْ أَرْسَلْنَاهُ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ بِسُلْطَانٍ
مُّبِينٍ ﴿٣٨﴾ فَتَوَلَّىٰ بِرُكْنِهِ وَقَالَ سَاحِرٌ أَوْ مَجْنُونٌ ﴿٣٩﴾ فَأَخَذْنَاهُ وَجُنُودَهُ
فَنَبَذْنَاهُمْ فِي الْيَمِّ وَهُوَ مُلِيمٌ ﴿٤٠﴾ وَفِي عَادٍ إِذْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ الرِّيحَ
الْعَقِيمَ ﴿٤١﴾ مَا تَذَرُ مِن شَيْءٍ أَتَتْ عَلَيْهِ إِلَّا جَعَلَتْهُ كَالرَّمِيمِ ﴿٤٢﴾
وَفِي ثَمُودَ إِذْ قِيلَ لَهُمْ تَمَتَّعُوا حَتَّىٰ حِينٍ ﴿٤٣﴾ فَعَتَوْا عَنْ أَمْرِ رَبِّهِمْ
فَأَخَذَتْهُمُ الصَّاعِقَةُ وَهُمْ يَنظُرُونَ ﴿٤٤﴾ فَمَا اسْتَطَاعُوا مِن قِيَامٍ
وَمَا كَانُوا مُنتَصِرِينَ ﴿٤٥﴾ وَقَوْمَ نُوحٍ مِّن قَبْلُ إِنَّهُمْ كَانُوا قَوْمًا
فَاسِقِينَ ﴿٤٦﴾ وَالسَّمَاءَ بَنَيْنَاهَا بِأَيْدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ﴿٤٧﴾ وَالْأَرْضَ
فَرَشْنَاهَا فَنِعْمَ الْمَاهِدُونَ ﴿٤٨﴾ وَمِن كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ
لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٤٩﴾ فَفِرُّوا إِلَى اللَّهِ إِنِّي لَكُم مِّنْهُ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٥٠﴾
وَلَا تَجْعَلُوا مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ إِنِّي لَكُم مِّنْهُ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٥١﴾

٥٢٢ كَذَٰلِكَ مَا أَتَى

**پاشەرۆژی قەومەکەی لووط:**

﴿[٣١] قال فما خطبكم أيها المرسلون﴾ ئیبراهیم وتی: جائەو ئیشە گرنگە ئێوە بۆی هاتوون چیە ئەی نێرراوەکانی خوا؟ ﴿[٣٢] قالوا إنا أرسلنا إلى قوم مجرمين﴾ وتیان: بەراستی ئێمە رەوانە کراوین بۆسەر هۆزێکی تاوانکار. بەڵیٚ ئیبراهیم پاش ئەوەی لەگەڵ (لووط)ی برازایدا, عێراق و سەرزەمینی (بابل)ی بەجێهێشت، ئیتر بۆ بلاوکردنەوەی یەك خوا پەرستیی و, وەلانانی فرەخواپەرستیی و فەسادو بیٚ رەوشتیی, بەرەو ولاتی (شام) رێگەی گرتەبەرو (لووط)یش بەتەنها چوو بۆشاری (سدوم), کە دەکەوێتە ناوچەی (ئوردن) و نزیکی دەریای مردوو (البحر الميت)، وەیەکێکە لەشارەگرنگەکانی هۆزو گەلەکەی خۆی لە ولاتی شام, شیاوی باسە ئەو جێگایە , جێگایەکی پڕ لەباخات ونازو نیعمەت بوو، بەڵام بەهۆی سەرپێچییەکانیانەوە خواسزای بۆ ناردن وسەروژێری کردن. ﴿[٣٣] لنرسل عليهم حجارة من طين﴾ تا کلۆ بەردێکی رەقی لەقوڕدروست بوووەك بەردیان لیٚ ببارێنن ﴿[٣٤] مسومة عند ربك للمسرفين﴾ نیشانەکراون لەلایەن پەروەردگارتەوە بۆ لەسنوور دەرچووان و یاخییان, گوتراویشە لەسەر هەر بەردێکَ ناوی ئەوکەسە نووسراوە! ﴿[٣٥] فأخرجنا من كان فيها من المؤمنين﴾ جا ئێمەش بڕوادارەکانمان لەشارەکانی گەلەکەی (لووت)دا بردنە دەریٚ بۆئەوەی بەسزاکەمان تیانەچن ﴿فما وجدنا فيها غير بيت من المسلمين﴾ ئەوسا لەویٚ تەنها ماڵێکی موسڵمان نەبیٚ –ئەویش ماڵی لووط و دوو کچەکەی– کەسێکی ترمان دەست نەکەوت باوەڕی هێنابیٚ! ﴿[٣٧] وتركنا فيها آية للذين يخافون العذاب الأليم﴾ وەلەوشارە وێرانەدا نیشانەیەکی ئاشکرامان بۆئەوانەی دەترسن لەسزای ئێش پێگەیەنەر بەجیٚ هێشت، واتە:پاش خۆیان, ئاسەواری خانوو بەرەکەیان دیاربوو, کرابوویە دەریایەکی بۆگەن وپیس, ئێستاش ناوبانگی: بە دەریاچەی (تەبەرییە) هەیە.

**لە سەرگروشتەی ئەمانە عیبرەت وەرگرن:**

﴿[٣٨] وفي موسى إذ أرسلنا إلى فرعون بسلطان مبين﴾ وە لەداستانی موساشدا نیشانەیە هەیە، ئەویش بە بەڵگەیەکی ئاشکراو نمایانەوە ناردمانە لای فیرعەون ﴿[٣٩] فتولى بركنه﴾ جا فیرعەون بەخۆی و لەشکرەکەیەوە رووی لەبڕوا بەمووساو بەپەیامەکەی وەرگێڕا ﴿وقال ساحر أو مجنون﴾ وتی موسا: جادوگەرە، جادوودەکات، یان دێوانەوشێتە، ئەگینا چۆن داوای پەیامبەرێتی ئەکات ﴿[٤٠] فأخذناه وجنوده فنبذناهم في اليم﴾ ئەوسا ئێمە خۆیی و لەشکرەکەیمان گرت وتورمان هەڵدایە ناودەریاکەوە ﴿وهو مليم﴾ بۆخۆیشی گلەیی لێکراوو، سەرزەنشت کراوبوو، واتە: بەوتۆڵەیە ستەمی لێنەکراوە لەلای ئێمەوە ﴿[٤١] وفي عاد إذ أرسلنا عليهم الريح العقيم﴾ وە لەبەسەرهاتی (عاد)یشدا بەڵگەو نیشانەی دەسەلاتمان دیارەو هەیە، ئەوکاتە کە (با)یەکی زۆر توندی گەرمی نەزۆك و بێخێرمان ناردە سەریان ﴿[٤٢] ما تذر من شئ اتت عليه﴾ کە بەسەر هەرشتێکدا تێدەپەڕی بە جێی نەدەهێشت ﴿إلا جعلته كالرميم﴾ و وەك ئێسکی پوواوی لێدەکردو، هەپروون هەپروون دەبووو بەربادی دەکرد.

بوخاریی/ فتح الباری: ٢/٦٠٤، موسلیم: ٢/٦١٧. هەردووئەم فەرموودەیانە هێناوە: ((نصرت بالصبا وأهلكت عاد بالدبور)) واتە: پێغەمبەر فەرمووی: من بەبای (سەبا) خوا سەریخستم، هۆزەکەی (عاد)یشی بەبای (دەبوور)، لەناو بردو تیاچوون ﴿[٤٣] وفي ثمود إذ قيل لهم تمتعوا حتى حين﴾ وە لەبەسەرهاتی (سەموود)یشدا - کاتێ پێیان وترا: تا ماوەیەك بۆخۆتان رابوێرن- پەندو ئامۆژگاریی مەزن هەیە بۆهەرکەسێك تێفکری!﴿[٤٤] فعتوا عن أمر ربهم﴾ جا لەفەرمانی پەروەردگاری خۆیان دەرچوون و بەگوێی پەیامبەرەکەیانیان نەکردو، وشترە موعجیزەکەیان کوشت! ﴿فأخذتهم الصاعقة﴾ جائەوهەورەتریشقەیە لێیدان وگرتنیی، وەك لە سوورەتێکیتردا ئەفەرموێ: (وأما ثمود فهديناهم فاستحبوا العمى على الهدى فأخذتهم صاعقة عذاب الهون) ﴿وهم ينظرون﴾ لەوکاتەشدا تەماشایان ئەکرد، چونکە پێشتر(صالح) بەڵێنی پێدابوون: پاش سێ‌ڕۆژ تر سزا دێتە سەرتان ﴿[٤٥] فما استطاعوا من قيام﴾ بەهەورە تریشقەکە وەهاکەوتن، توانای هیچ جۆرە هەڵسانێکیان نەما ﴿وماكانوا منتصرين﴾ و نەشیانتوانی خۆیان سەرخەن ﴿[٤٦] وقوم نوح من قبل﴾ بەر لەوانیش هۆزەکەی (نووح)مان- بەتۆفان-لەناوبرد ﴿إنهم كانوا قوما فاسقين﴾ چونکە گەلێکی کافربوون و لە هەق لایاندا.

**بەم بەڵگانە خوا ی هەق بناسن:**

﴿[٤٧] والسماء بنيناها بأييد﴾ ئەم ئاسمانەشمان - بێ کۆڵەکەو بێ ئامێرێکی دیکە - بەهێزو مەحکەم دروست کرد ﴿وإنا لموسعون﴾وە بەردەوامیش پەرەی پێدەدەین و فراوانی دەکەین، جا بۆئەوەش هیچ نارحەتیی و ماندوو بوونێکمان تووش نابێ ﴿[٤٨] والأرض فرشناها فنعم الماهدون﴾ و زەویشمان راخست بۆژیان ئای چ ڕاخەرێکی چاکین ئێمە ﴿[٤٩] ومن كل شئ خلقنا زوجين﴾ وە لە هەرشتێك جووتێکمان دروستکردووە: نێرومێ، شیرین و ترش، خۆرو مانگ، شەوو رۆژ.. ﴿لعلكم تذكرون﴾ بەڵکو ئامۆژگاری وەربگرن باوەڕ بە تواناو دەسەڵاتمان بێنن ﴿[٥٠] ففروا إلى الله﴾ جاهەمووتان بەڕاکردن بەرەوخوا هەڵبێن، واتە: لەهەموو کارێکدا تەنیا گوێرایەڵی ئەوبن ﴿إني لكم منه نذير مبين﴾ بەڕاستیی من (واتە: پێغەمبەر) لەلایەن خواوە ترسێنەرێکی ئاشکرام بۆ ئێوە کاروبارم ئاشکرایەو خوایش پشتیوانیم لێدەکات ﴿[٥١] كذلك ما أتى الذين من قبلهم من رسول﴾ باوی هۆزەکانی پێش ئەمانیش هەروابوو، هەر پێغەمبەرێك خوا ناردوویەتی و چووە بۆلای هۆزەکەی ﴿إلا قالوا ساحر أو مجنون﴾ هەرپێیان وتووە جادوگەرە، یان شێتە ﴿[٥٢] أتواصوا به﴾ ئایا وەسیەتیان بۆ یەکتر کردووە بەوە وا رایان کۆیە لەسەر ئەو بۆچوونەیان؟ ﴿بل هم قوم

طاغون﴾ نەخێر، وەسیەتیان بۆ یەکتر نەکردووە، بەڵکو ئەوانە بۆخۆیان گەلێکی یاخیی ولەسنوور دەرچوون، بۆیە ئەوقسانە دەکەن ﴿فتول عنهم﴾ جا کەوایە تۆواز لەوانە بێنەو ڕوویان لێوەرگێڕە، واتە: ئەوەندە بایەخیان بۆ دامەنێ ﴿فما أنت بملوم﴾ لەسەر لاریی ئەوان کەسێك سەرکۆنەی تۆناکا ﴿٥٥ وذكر فإن الذكرى تنفع المؤمنين﴾ تۆ بەردەوام ئامۆژگاری بکە، چونکە ئامۆژگاری هەمیشە کەڵك بەبڕواداران ئەگەیەنێ ئەگەرچی ئەوانەش سوودی لێوەرنەگرن.

**دروستکرانی جینی و مرۆڤ هەر بۆ پەرەستنی خوایە:**

﴿٥٦ وما خلقت الجن والإنس إلا ليعبدون﴾ و من هەربۆیە جنۆکەو ئادەمیم دروستکردووە بمپەرستن و بمناسن، چونکە ئەگەر لەنەبوونەوە نەمهێنابان، نەیان ئەناسیم و گەورەییم دەرنەئەکەوت بۆیان، ئەم (ئەسەر)ـەش کە دەڵی: ((کنت کنزا مخفیا فأردت أن أعرف، فخلقت الخلق)) هەرهێمایە بەوە ﴿٥٧ ما اريد منهم من رزق﴾ من هیچ ڕزق و ڕۆزیم لەوان ناوێ بۆخۆم ﴿وما اريد ان يطعمون﴾ و نایشمەوێ ئەوان خۆراکم بدەنێ ﴿٥٨ إن الله هو الرزاق﴾ چونکە تەنها هەرخوایە ڕۆزیدەر ﴿ذو القوة المتين﴾ خاوەن هێزی چار نەکراو، کەس ناتوانێ چاری خوا بکاو زاڵ ببێ بەسەریدا. لەفەرموودەی (قودسیی)دا هاتووە: ((یا ابن آدم! تفرّغ لعبادتی إملأ صدرك غِني، واسُدّ فقرك، وإلا تفعل ملأتُ صدركَ شُغلا ولم أسُدّ فقرك)) پێشەوا ئەحمەد. ٢/ ٣٥٨، ترمزیی و ئیبن ماجە. واتە: ئەی کوڕی ئادەم! خۆت یەکلابکەوە بۆپەرستنی من، ئەوسا منیش دڵ و دەروونت پڕئەکەم لەقەناعەت و بێ نیازیی و، دەرگای هەژاریت لێدادەخەم، ئەگینا دڵ و دەروونت پڕئەکەم لەسەر قاڵبوون بە دونیاوەو، دەرگای هەژاریشت لێداناخەم.

وە ئەم فەرموودەش هاتووە: ((إنی أنا الرزاق، ذوالقوة المتین)). ئیمامی ئەحمەد: ٤١٨/١. ئەبوو داود، نەسائی. ﴿٥٩ فإن للذين ظلموا ذنوبا مثل ذنوب أصحابهم﴾ جا بێگومان بۆئەوانە ستەمیان لەخۆیان کردووە بەشیرك بەشێك لەسزایان بۆهەیە، وەك بەشی هاوەڵەکانیان لە گەلانی پێشوو ﴿فلا يستعجلون﴾ جا با بۆسزا پەلەم لێنەکەن پێش کاتی خۆی، چونکە هەربۆیان پێش دێت ﴿٦٠ فويل للذين كفروا من يومهم الذى يوعدون﴾ جا تیاچوون بۆکافرو خوانەناسان لەو ڕۆژەی بەڵێنیان پێدراوە، لەبەر زۆری سەختی و دژواریی.

الجزء السابع والعشرون — سورة الذاريات

كَذَٰلِكَ مَآ أَتَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا قَالُوا۟ سَاحِرٌ أَوْ مَجْنُونٌ
(٥٢) أَتَوَاصَوْا۟ بِهِۦ ۚ بَلْ هُمْ قَوْمٌ طَاغُونَ (٥٣) فَتَوَلَّ عَنْهُمْ فَمَآ أَنتَ
بِمَلُومٍ (٥٤) وَذَكِّرْ فَإِنَّ ٱلذِّكْرَىٰ تَنفَعُ ٱلْمُؤْمِنِينَ (٥٥) وَمَا
خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ (٥٦) مَآ أُرِيدُ مِنْهُم مِّن رِّزْقٍ
وَمَآ أُرِيدُ أَن يُطْعِمُونِ (٥٧) إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ذُو ٱلْقُوَّةِ ٱلْمَتِينُ
(٥٨) فَإِنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ذَنُوبًا مِّثْلَ ذَنُوبِ أَصْحَٰبِهِمْ فَلَا يَسْتَعْجِلُونِ
(٥٩) فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن يَوْمِهِمُ ٱلَّذِى يُوعَدُونَ (٦٠)

سُورَةُ الطُّورِ — ترتيبها ٥٢ — آياتها ٤٩

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلطُّورِ (١) وَكِتَٰبٍ مَّسْطُورٍ (٢) فِى رَقٍّ مَّنشُورٍ (٣) وَٱلْبَيْتِ
ٱلْمَعْمُورِ (٤) وَٱلسَّقْفِ ٱلْمَرْفُوعِ (٥) وَٱلْبَحْرِ ٱلْمَسْجُورِ (٦) إِنَّ
عَذَابَ رَبِّكَ لَوَٰقِعٌ (٧) مَّا لَهُۥ مِن دَافِعٍ (٨) يَوْمَ تَمُورُ ٱلسَّمَآءُ
مَوْرًا (٩) وَتَسِيرُ ٱلْجِبَالُ سَيْرًا (١٠) فَوَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ
(١١) ٱلَّذِينَ هُمْ فِى خَوْضٍ يَلْعَبُونَ (١٢) يَوْمَ يُدَعُّونَ إِلَىٰ نَارِ
جَهَنَّمَ دَعًّا (١٣) هَٰذِهِ ٱلنَّارُ ٱلَّتِى كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ (١٤)

٥٢٣

سوپاس بۆ خوا، لە(٦)ی شەعبانی (١٤١٧)ك بەرامبەر بە(١٩٩٦/١٢/١٦) لەنووسینی ئەم سوورەتە بوومەوە، لەڕاگەیاندنی ناوەندیی بزووتنەوەی ئیسلامیی لە کوردستان/ عێراق، لەشاری هەڵەبجەی شەهیدان.

*** *** ***

## ٥٢- سوورەتی ( طور )ـە

## مەككەییەو ( ٤٩ ) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئـەمیش هـەر لەباسـی بیروبـاوەڕو ئایدۆلۆژیـەتی ئیسـلامیی ئـەدوێ: یەكخواناسـین، پـەیام، زینـدوو بوونـەوە، پاداشت و تۆڵە,سەرەتا باسێكی سامناكی ڕۆژی دوایـی دەكات كـە ئەوهـەمووئازاروو سزایە ڕووبەڕووی كافرو بێ بڕواكـان ئەبێتـەوەو هـیچ شـتێكیش نییـە بتـوانێ بەرهەڵسـتی بووەسـتێ، پاشـان باسـی لەخواترسـان و پارێزگـاران ئـەكات، باسـی ئەوهـەموو پاداشـت و ڕێـز لێنانـەیان دەكـات، دواتـر باسـی دواهـەمین پـەیام دەكـات: پەیامەكـەی (موحەممەدی كوڕی عەبدوڵلا) داوا لەپەیامبەریش دەكات كەئەوەندە گرنگی نەدات بەو قسەو قسەڵۆكانەی بێ بڕواكان ئەیلێن، جابۆدواتر بەرامبەر ئەوشك وگومانەی موشریكان هەیانبوو لەپەیامبەرێتی موحەممەد ﷺ بێزاری دەردەبڕێ. لەگەورەیی و فەزیلەتی ئەم سوورەتەدا هاتووەكە: (جوبەیری كوڕی مونعیم) دەڵێ: جارێك گوێم لێبوو پێغەمبەر ﷺ لەنوێژی شێواندا سوورەتی (طور)ی دەخوێند، كەسێكی دیكەم نەدیتبوو دەنگی، یان خوێندنەوەی لەوباشتربێ، متفق علیه. فتح الباري: ٢٨٩/٢، مسلم: ٣٣٨/١، پاشان بوخاریش بەتەنیا ئەم فەرمووده ڕیوایەت دەكات: (ئوممی سەلەمە) دەڵێ: (لەكاتی حەجدا) سكاڵام بردەلای پێغەمبەر ﷺ كە نەخۆشم و توانای تەوافی ماڵی خوام نیە، ئەویش فەرمووی: دەبڕۆ لەدوای خەڵكەوە بەسواریی تەوافی خۆت بكە، دەڵێ تەوافم كردو، دیتم پێغەمبەر ﷺ لەكەناری ماڵەوە نوێژ دەكاو، سوورەتی (طور) دەخوێنێ. فتح الباری: ٤٦٨/٨.

### سوێند بە هەموو ئەمانە سزا بەڕێوەیە :

﴿بسم الله الرحمن الرحيم* ١ والطور﴾ سوێند بە كێوی (طور- سیناء) كەپەروەردگار لە گەڵ موسادا لەوێ وتوو
وێژی كرد ﴿٢ وكتاب مسطور﴾ سوێند بەكتێب ونامەیەكی نووسراوە(تەورات)، یان قورئان، یانامەی كردەوەكان،
یا(لەوحولمەحفوز) ﴿٣ فی رق منشور﴾ والآكراو لەپێستێكی تەنك وناسكدا, كە بۆهەمووكەس حوكم وبڕیاروئاداب
و وێڵـەكانی ئاسـانە ﴿٤ والبیـت المعمـور﴾ سـوێند بـەخانووی هەمیشـە ئـاوەدان لەمەككـەدا (كەعبـەی پـیرۆز،
كەهەموسـاڵێك بـەملیۆن خواپەرستیار ئاوەدان دەكرێتـەوە. (تەبـەریی) ئـەڵێت: سوێند بـەوخانووەی كەلەسـەرووی
ئاسـتی كەعبـەدا لەپشـت ئاسـمانی حەوتەمـەوە بەفریشـتەیەكی زۆرو زەبەنـە ئـاوەدان كراوەتـەوە. لەفەرموودەیـەكی
صەحیح دا لە (بوخاریی)ەوە، -فتح الباری: ٣٤٩/٦، موسلیم: ١٥٠/١- داهاتووە كە:((إنه يدخله كل يوم سبعون
ألفا مـن الملائكة، ثـم لا يعودون إليـه أبدا)) واتـە: بێگومـان هـەرڕۆژەی حەفتاهـەزار فریشـتە دەچنە نێو (بیت
المعمور)ەوە پاشان ئیتر ئەوانە هەرگیز جارێكی تربۆی ناگەڕێنـەوە بەڵكو دەستەیەكیتر دێن ﴿والسقف المرفوع﴾
سـوێند بـەملا ژوورەی بـەرزو بڵنـدە, واتـە: بـەئاسمانی پڕ لەئەستێرەو خۆرومانگ و..هتـد ﴿٦ والبحـر المسجور﴾
سـوێند بـەو دەریایـەی كـە بەربەسـتكراوە لـەوەی بتەقێتـەوەو دونیـا داپۆشـێ,هەنـدێ ئـەڵێن مەبەسـت بەودەریایـە
,دەریـای هـێمن (هـادیء)ـە، كـە شەسـت وهەشـت ملیۆن میل چـوار گۆشـەیە، قوڵیەكەشـی لەهەنـدێ لاوە نۆهـەزارو
چوارسەدو سیوسێ مەترە، ڕووبەرەكەشی بەتێكڕایی دووجارونیو بەئەندازەی هـەموو وشكانی دنیایـە، جا ئەگـەر
دەسەلاتێك نەبێ چاودێریی ئەوەبكات، ئایا بۆی نیە وردەوردە هـەموو زەوی دابپۆشـێ؟بەڵێ خـوا سـوێند بـەوپێنج
شتە ئەخوات:﴿٧ إن عذاب ربك لواقع﴾ كە بێگومان سزای پەروەردگاری تۆ (ئەی موحەممەد!) هـەر پێش دێت ﴿٨
ماله من دافع﴾ هیچ ڕەتكەرەوەیەكیشی بۆ نیە , كەس ناتوانێ بەریبگرێ ﴿٩ یوم تمور السماء مورا﴾ ئەو ڕۆژەیە

کەئاسمان بەتوندی دێت ودەڕوات و ئەکەوێتە لەرزەو شۆکە و گەڕان و خوا هەمووی تێکدەدا ﴿١٠ وتسير الجبال سيرا﴾ کێوەکانیش لەجێگەی خۆیاندا هەڵدەکنرێن ودەڕۆن, واتە: یاسای بوونەوەر تێك ئەچێ و جارێکی تر بەکەڵکی ژیان نایەت ﴿١١ فويل يومئذ للمكذبين﴾ ئیتر لەورۆژەدا تیاچوون بۆئەوانەی پێغەمبەرەکانیان بەدرۆ ئەخستەوەو, هەرخەریکی بەدرۆخستنەوە بوون ﴿١٢ الذين هم فىخوض يلعبون﴾ ئەوانەی لەکاری ناڕەوادا هەردەم رۆئەچن و, گاڵتە و گەمە دەکەن ﴿١٣ يوم يدعون إلى نار جهنم دعا﴾ ئەورۆژەی کە ئەوانە زۆر بەتوندی پاڵیان پێوە ئەنرێ بۆ ناو ئاگری دۆزەخ و ڕادەکێشرێن ﴿١٤ هذه النار التى كنتم بها تكذبون﴾ هەر کەنزیك خرانەوە پێیان ئەوترێ: ئەمە ئەو ئاگرەیە کەئێوە کاتیخۆی بەدرۆتان دائەناو بڕواتان پێی نەبوو!! ﴿١٥ افسحر هذا ام انتم لاتبصرون﴾ پێیان دەوترێت: باشە ئەمەجادووە – وەك لەدونیادا، کاتێ پەیامبەر ﷺ قسەی بۆدەکردن ئەتان وت جادووە- یان ئێوە نابینن و کوێرن، هەروەك لەدونیادا خۆتان لەئاستی ئەورۆژە کوێر دەکرد؟ ﴿١٦ إصلوها فاصبروا اولا تصبروا﴾ بچنە ناویەوەو بسوتێن، جا ئیترئارامتان ببێ یان نەبێ ﴿سواء عليكم﴾ وەك یەك وایە بۆئێوە, ﴿إنما تجزون ماكنتم تعملون﴾ چونکە هەرد بەپێی ئەوەی ئەتانکرد لە دنیادا,پاداشت دەدرێنەوە.

**خەڵکانی لە خوا ترس , لە بەهەشتدا فەرەحناکن:**

پاش باسکردنی پاداش و تۆڵەی بێباوەڕان، دێتە سەر باسیپاداشتی موسڵمانان، بۆیە ئەفەرموێ: ﴿١٧ إن المتقين فى جنات ونعيم﴾ بێگومان خۆپارێزان – لەرۆژی قیامەتدا- لەبەهەشتەکان و خۆشگوزەرانیەکی هەمیشەییدان و ژیان دەبەنە سەر ﴿١٨ فاكهين بما آتاهم ربهم﴾ بەوەی پەروەردگاریان پێی بەخشیون خۆشحاڵن ﴿ووقاهم ربهم عذاب الجحيم﴾ پەروەردگاریشیان لەسزای دۆزەخ پاراستوونی ﴿١٩ كلوا واشربوا هنيئا بما كنتم تعملون﴾ پێیان ئەوترێ: دەسابەهۆی ئەوکارانەوە لەدونیادا ئەنجامتان دەدان, بخۆن و بخۆنەوە ﴿٢٠ متكئين على سرر مصفوفة﴾ لەسەر قەنەفەی ریزکراو ,پاڵیانداوەتەوەو روویان لەیەککردووە ﴿وزوجناهم بحورعين﴾ هاوسەرمان کردوون بە ژنانیسپی چاوگەورە(حور العين).

**تۆرەمەو زارۆڵەی ئیماندارانیش دەبەینە بەهەشت:**

﴿٢١ والذين آمنوا واتبعتهم ذريتهم بإيمان﴾ وە ئەوکەسانەی باوەڕیان هێناو نەوەکانیشیان بەئیمانەوە پەیڕەوییان لێکردوون ﴿الحقنا بهم ذريتهم﴾ زاڕۆو نەوەکانیشیانمان پێگەیاندن لەبەهەشتدا ,هەرچەندە کردەوەکانیشیان شایستەی ئەوپلەیە نەبێ، بەڵام لەبەر ڕێزوحورمەتی ئەوان ,وەك (ئیبن عەبباس) دەڵێت: تا زیاتر کەیفخۆش ودڵخۆش بن، هەر (ئیبن عەباس) (خوای لێ رازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((إن الله عز وجل

الجزء السابع والعشرون — سورة الطور

أَفَسِحْرٌ هَٰذَآ أَمْ أَنتُمْ لَا تُبْصِرُونَ ﴿١٥﴾ ٱصْلَوْهَا فَٱصْبِرُوٓا۟
أَوْ لَا تَصْبِرُوا۟ سَوَآءٌ عَلَيْكُمْ إِنَّمَا تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٦﴾
إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى جَنَّٰتٍ وَنَعِيمٍ ﴿١٧﴾ فَٰكِهِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمْ رَبُّهُمْ
وَوَقَىٰهُمْ رَبُّهُمْ عَذَابَ ٱلْجَحِيمِ ﴿١٨﴾ كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ هَنِيٓـًٔا بِمَا
كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٩﴾ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ سُرُرٍ مَّصْفُوفَةٍ وَزَوَّجْنَٰهُم
بِحُورٍ عِينٍ ﴿٢٠﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّبَعَتْهُمْ ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَٰنٍ أَلْحَقْنَا
بِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَمَآ أَلَتْنَٰهُم مِّنْ عَمَلِهِم مِّن شَىْءٍ كُلُّ ٱمْرِئٍۭ بِمَا كَسَبَ
رَهِينٌ ﴿٢١﴾ وَأَمْدَدْنَٰهُم بِفَٰكِهَةٍ وَلَحْمٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ ﴿٢٢﴾ يَتَنَٰزَعُونَ
فِيهَا كَأْسًا لَّا لَغْوٌ فِيهَا وَلَا تَأْثِيمٌ ﴿٢٣﴾ ۞ وَيَطُوفُ عَلَيْهِمْ غِلْمَانٌ
لَّهُمْ كَأَنَّهُمْ لُؤْلُؤٌ مَّكْنُونٌ ﴿٢٤﴾ وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَآءَلُونَ
﴿٢٥﴾ قَالُوٓا۟ إِنَّا كُنَّا قَبْلُ فِىٓ أَهْلِنَا مُشْفِقِينَ ﴿٢٦﴾ فَمَنَّ ٱللَّهُ
عَلَيْنَا وَوَقَىٰنَا عَذَابَ ٱلسَّمُومِ ﴿٢٧﴾ إِنَّا كُنَّا مِن قَبْلُ
نَدْعُوهُ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْبَرُّ ٱلرَّحِيمُ ﴿٢٨﴾ فَذَكِّرْ فَمَآ أَنتَ بِنِعْمَتِ
رَبِّكَ بِكَاهِنٍ وَلَا مَجْنُونٍ ﴿٢٩﴾ أَمْ يَقُولُونَ شَاعِرٌ نَّتَرَبَّصُ بِهِۦ رَيْبَ
ٱلْمَنُونِ ﴿٣٠﴾ قُلْ تَرَبَّصُوا۟ فَإِنِّى مَعَكُم مِّنَ ٱلْمُتَرَبِّصِينَ ﴿٣١﴾

ربع الحزب ٥٣

أَمْ تَأْمُرُهُمْ ٥٢٤

ليرفع ذرية المؤمن معه فى درجته فى الجنة وإن كان لم يبلغها بعمله لِتقَرَ بِهِمْ عينه)) و الحديث ذكره الهيثمي في مجمع الزوائد. (١١٣٧٠)، عن إبن عباس (رضى الله عنه) رفعه إلى النبى ﷺ وتعقبه بقوله: رواه البزار، و فيه قيس بن الربيع، وثقه شعبة والثورى وفيه ضعف) ﴿وما التناهم من عملهم من شئ﴾ وەلە هەمانكاتدا لەكردەوەی ئەوانەی پلەی بەرزيان دەستكەوتووە, شتێ كەم ناكەينەوە ,بەهۆی بەرزكردنەوەی پلەی منداڵەكانيان ﴿كل امرئ بما كسب رهين﴾ هەمووكەسێك بارمتەی كاروكردەوەی خۆيەتی , گوناهی كەسی دیكە نادرێ بەسەریا، ئەگەرچی باوك وكوڕو براو كەس وكاریشبن، مەگەر درێغی كردبێت لەپەندو ئامۆژگاریی ﴿[٢٢] وأمددناهم بفاكهة ولحم مما يشتهون﴾ وە زیاد لەوەیش حەزیان لەهەرمیوەو گۆشتێك بێت، دەیاندەینێ.

**شەرابی بەهەشت هەرزە بێژیی تێدانییە :**

﴿[٢٣] يتنازعون فيها كاسا﴾ جارجار بۆخۆشی لەبەهەشتدا جام وپیاڵەی پڕ لەشەراب لەیەكتر ئەفڕێنن ﴿لا لغو فيها ولا تأثيم﴾ نەهەرزەبێژی تێدایە , نەگوناهباركردن ﴿[٢٤] ويطوف عليهم غلمان لهم﴾ وە چەند تازە لاوێكی ئێسك سووك بۆخزمەتكردن بەسەریاندا ئەگەڕێن و خزمەت ئەكەن ﴿كأنهم لؤلؤ مكنون﴾ لەجوانیی و پاك و خاوێنیدا دەڵێی مرواری ناوصەدەفن ﴿[٢٥] واقبل بعضهم على بعض يتساءلون﴾ هەندێكیشیان رووەدەكەنە هەندێكیان لەیەك ئەپرسن: لەوەی لەسەری بوون لە دنیادا لە ئەهواڵ وئەعماڵ ﴿[٢٦] قالوا إناكنا قبل فى أهلنا مشفقين﴾ ئەڵێن: ئێمە لەمەپێش لەدنیادا بووین لەناوژن ومناڵماندا لە سزایخوا دەترساین ,بۆیە ئێستا ئەویش ئەم بەهرە مەزنەیەی پێ بەخشین ﴿[٢٧] فمن الله علينا﴾ ئینجا خوا منەتی خستە سەرمان بە مەرحەمەتی خۆی ﴿ووقانا عذاب السموم﴾ و لەسزای ئاگری هاڵاودار پاراستوونی ﴿[٢٨] إنا كنا من قبل ندعوه﴾ ئەڵێن: بەراستی ئێمە كاتی خۆی لەدونیادا هاناو هاوارمان هەر بۆخوا دەبردو هەرئەومان ئەپەرست , وائەویش ئێستا وەڵامی داینەوە ﴿إنه هو البر الرحيم﴾ بەڕاستیی ئەوخوایە زاتێكی چاكەخوازی دڵاوایە. ﴿[٢٩] فذكر فما انت بنعمة ربك بكاهن ولا مجنون﴾ جاكەوابوو تۆش ئەی موحەممەد! ﷺ ئامۆژاری بەردەوام بكە, ئەتۆش بە هۆی چاكەی خواوەندتەوە بەپێغەمبەرێتی ,نوقڵانە لێدەروشێت نیت، وەك ئەو نەفامانە ئەڵێن!! بەڵكو هەمووشتێك بەپێی سروش و نیگایە، ئەم ئایەتە بۆ رەتی قسەی (عوقبەی ئەبی موعەیت) بوو، كە جارجار بەپێغەمبەری ئەوت: شێتە, جادووگەرە! ﴿[٣٠] ام يقولون شاعر نتربص به ريب المنون﴾ یاخۆ ئەڵێن: موحەممەد شاعیرە, چاوەڕوانی مردنی ئەكەین تالەدەستی رزگارمان بێت. ﴿[٣١] قل تربصوا فإنى معكم من المتربصين﴾ پێیان بڵێ: چاوەڕوان بن! جا بێگومان منیش لەگەڵ ئێوە لەوانەم چاوەڕوانی دەرەنجامی من وئێوەن؟ جا خوای گەورە ئەوانی لەرۆژی (بەدر)دا بەزوویی تیابرد ﴿[٣٢] ام تأمرهم احلامهم بهذا﴾ یاخۆ ژیرییان فەرمانیان پێدەدا بەم قسە ناقۆڵایانە؟! ناودارانی قورەیش خۆیان بەگەلێكی ژیرو بە ئاوەز دادەنا، بۆیە خوایش ئەو جۆرە پرسیارانەیان ئاراستە دەكات , دیارە ئەگەر راستە ژیربوونایە– وەك خۆیان وادەڵێن– ئەوەند لاسار نەدەبوون ﴿ام هم قوم طاغون﴾ یاخۆ خۆیان گەلێكی سەركەش ویاخین؟! ﴿[٣٣] ام يقولون تقوله﴾ یان خۆ ئەڵێن: (محمد) ئەوقورئانەی لەسەر خوا هەڵبەستووە؟! ﴿بل لا يؤمنون﴾ نا, بەڵكو ئەوانە باوەڕناهێنن , بۆیە بێ باكانەئەو توانجانە دەگرن.ئینجا خواهەموو بەدگومانیەكیان رەت ئەكاتەوە ئەفەرموێ: ﴿[٣٤] فليأتوا بحديث مثله إن كانوا صادقين﴾ جابا قسەیە وێنەی ئەو قورئانە بێنن , ئەگەر راستیان دەكرد لەو وتەیاندا كە ئەیانوت موحەممەد خۆی ئەم قورئانەی هەڵبەستووە ﴿[٣٥] ام خلقوا من غير شئ﴾ یا خۆ هەر لەخۆیانەوە دروستبوون، وا ئەوەندە سەربەستن وبەئارەزووی خۆیان قسەئەكەن و منەتی هیچ كەسێك نازانن؟ ﴿ام هم الخالقون﴾ یا هەرخۆیان

دروستکەری خۆیانن؟ ﴿<sup></sup>٣٦ ام خلقوا السموات والأرض﴾ یائاسمانەکان و زەوییان دروست کردووە؟ ﴿بل لا یوقنون﴾ نەخێر بەڵکو یەقینیان بەخواو بە ڕۆژی پاداشت و تۆڵەنیە "بۆیەئاوا بەئارەزووی خۆیان شەن ئەکەن ﴿٣٧ ام عندهم خزائن ربك﴾ یاخۆ کلیلی خەزێنەو گەنجینەکانی پەروەردگاری تۆیان لایە؟ تائەوان خواستیان نەبێت پەیامبەرێتی بەکەسێ نەدرێ ﴿ام هم المسیطرون﴾ یا خێر هەمووشتێکیان بەدەستەو دەسەڵاتداران, هەتا بەئارەزووی خۆیان ئاڵ وگۆڕ بکەن. زمان ناسەکان دەڵێن: (وفیه ثلاث لغات: الصاد وبها قرأت العامة، والسین وهي قراءة إبن محیصن وحمید و مجاهد، وبإشمام الصاد والزاي وهي قراءة حمزة کما تقدم فی "الصراط" فی سورة الفاتحة)﴿٣٨ ام لهم سلم یستمعون فیه﴾ یا خێر نەردیوان و پەیژەیەکیان بۆ هەیە؟ پیایدا سەرئەکەون بۆ ئاسمان, لەوێ گوێ ئەگرن بۆ وتوو وێژی فریشتەکان ﴿فلیأت مستمعهم بسلطان مبین﴾ جا ئەگەر وایە دەبا گوێگرەکەیان بەڵگەیەکیئاشکرا بهێنێ ﴿٣٩ ام لە البنات ولکم البنون﴾ یاخۆ کوڕان بۆ ئەوەو وکچانیش بۆ ئێوە ,بۆیە پێتان وایە فریشتە کچی خوان! لەکاتێکا ئێوە خۆتان رازی نابن بەکچ، جائیتر چۆن بڕیاری وائەدەن بۆ ئەوخوا زاڵ و دەسەڵاتدارە؟! دیارە کەسێك ژیریی هەرئەوەندەبێ، بێگومان ئینکاری زیندووبوونەوەش دەکات ﴿٤٠ ام تسألهم اجرا فهم من مغرم مثقلون﴾ یا خێر تۆ ئەی موحەممەد! ﷺ داوای کرێ و مزەیان لێئەکەیت لەسەر هیاندنی پەیامەکەت , ئەوانیش لەژێر باریقورس و گرانیدا دەرناچن؟! ﴿٤١ ام عندهم الغیب فهم یکتبون﴾ یاخێر نادیاروغەیبیان لایە, هەرچیان ویست لێی دەنووسنەوە؟ ﴿٤٢ ام یریدون کیدا﴾ یاخۆ ئەیانەوێ پیلان وفرت وفێڵێك رێك بخەن؟ ﴿فالذین کفروا هم المکیدون﴾ کافران هەرخۆیان فرت و فێڵلێکراون، وەك لە (بەدر)دا بەچاو بینرا: گەلێ لەسەرانیان تیاچوون ﴿٤٣ ام لهم إله غیر الله﴾ یا خێر پەرستراوێکیان جگە لە(الله) هەیە؟!هەتابیکەن بەشەریکی خوا ﴿سبحان الله عما یشرکون﴾ پاکیو بێگەردی بۆخوا , لە شەریکیٚ ئەوان بۆ خوای بۆدادەنێن.

أَمۡ تَأۡمُرُهُمۡ أَحۡلَـٰمُهُم بِهَـٰذَآۚ أَمۡ هُمۡ قَوۡمٞ طَاغُونَ ﴿٣٢﴾ أَمۡ يَقُولُونَ تَقَوَّلَهُۥۚ
بَل لَّا يُؤۡمِنُونَ ﴿٣٣﴾ فَلۡيَأۡتُواْ بِحَدِيثٖ مِّثۡلِهِۦٓ إِن كَانُواْ صَٰدِقِينَ
﴿٣٤﴾ أَمۡ خُلِقُواْ مِنۡ غَيۡرِ شَيۡءٍ أَمۡ هُمُ ٱلۡخَٰلِقُونَ ﴿٣٥﴾ أَمۡ خَلَقُواْ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَۚ بَل لَّا يُوقِنُونَ ﴿٣٦﴾ أَمۡ عِندَهُمۡ خَزَآئِنُ
رَبِّكَ أَمۡ هُمُ ٱلۡمُصَۜيۡطِرُونَ ﴿٣٧﴾ أَمۡ لَهُمۡ سُلَّمٞ يَسۡتَمِعُونَ فِيهِۖ فَلۡيَأۡتِ
مُسۡتَمِعُهُم بِسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٍ ﴿٣٨﴾ أَمۡ لَهُ ٱلۡبَنَٰتُ وَلَكُمُ ٱلۡبَنُونَ ﴿٣٩﴾
أَمۡ تَسۡـَٔلُهُمۡ أَجۡرٗا فَهُم مِّن مَّغۡرَمٖ مُّثۡقَلُونَ ﴿٤٠﴾ أَمۡ عِندَهُمُ ٱلۡغَيۡبُ فَهُمۡ
يَكۡتُبُونَ ﴿٤١﴾ أَمۡ يُرِيدُونَ كَيۡدٗاۖ فَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ هُمُ ٱلۡمَكِيدُونَ ﴿٤٢﴾
أَمۡ لَهُمۡ إِلَٰهٌ غَيۡرُ ٱللَّهِۚ سُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴿٤٣﴾ وَإِن يَرَوۡاْ كِسۡفٗا
مِّنَ ٱلسَّمَآءِ سَاقِطٗا يَقُولُواْ سَحَابٞ مَّرۡكُومٞ ﴿٤٤﴾ فَذَرۡهُمۡ حَتَّىٰ يُلَٰقُواْ
يَوۡمَهُمُ ٱلَّذِي فِيهِ يُصۡعَقُونَ ﴿٤٥﴾ يَوۡمَ لَا يُغۡنِي عَنۡهُمۡ كَيۡدُهُمۡ شَيۡـٔٗا
وَلَا هُمۡ يُنصَرُونَ ﴿٤٦﴾ وَإِنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُواْ عَذَابٗا دُونَ ذَٰلِكَ وَلَٰكِنَّ
أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٤٧﴾ وَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعۡيُنِنَاۖ وَسَبِّحۡ
بِحَمۡدِ رَبِّكَ حِينَ تَقُومُ ﴿٤٨﴾ وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَسَبِّحۡهُ وَإِدۡبَٰرَ ٱلنُّجُومِ ﴿٤٩﴾

سُورَةُ النَّجۡمِ ترتيبها ٥٣ آياتها ٦٢

٥٢٥

**تێبینی:** وشەی (أم) - کە لەم سوورەتەدا بۆسەرزەنشت و بێزاری دەربڕینە لەکارە چەوتەکانی ئەوان - پازدەجار هاتووە.

**عینادی موشریکان و جەزرەبەدانیان:**

﴿٤٤ وان یروا کسفا من السماء ساقطا﴾ وەئەگەر لەسەرەنجامیکارە نادروستەکانیانەوە , ببینن پارچەیەکی گەورە لەئاسمانەوە بەربێتە خوارەوە بەسەریاندا ﴿یقولوا سحاب مرکوم﴾ ئەوکاتەیش ئەڵێن: پەڵە هەورێکی لەسەر یەك نیشتووە! "واتە: هێمان هەر ئینکاری ئەکەن , وەك لەم ئایەتەشدا هاتووەو دەفەرموێ: (ولو فتحنا علیهم بابا من السماء فظلوا فیه یعرجون لقالوا إنما سکرت أبصارنا بل نحن قوم مسحورون)١٥/١٤-١٥ ﴿٤٥ فذرهم حتی یلاقوا

يومهم الذى فيه يصعقون﴾ جا كەوابوو وازيان لىٚبيٚنە تا ئەگەن بەو رۆژەى لەناودەبريٚن ودەكوژريٚن ﴿ ٤٦ يوم لا يغنى عنهم كيدهم شيئا﴾ ئەو رۆژە فيٚلٚەكەيان فريايان ناكەوىٚ وهيچ كەلٚكيان پىٚناگەيەنىٚ و بىٚنيازيان ناكا ﴿ولا هم ينصرون﴾ وەلەهيچ لايەكەوە يارمەتيش نادريٚن ﴿ ٤٧ وإن للذين ظلموا عذابا دون ذلك﴾ وە بيٚگومان بۆ ئەوانەى ستەمكاربوون , سزايەك هەيە لەدنيادا , بەرلە هاتنى قيامەت , وەكو گرانيى و، قات وقرِيى و..هتد, وەك لە سوورەتيٚكى تردا ئەفەرمويٚ: (ولنذيقنهم من العذاب الأدنى دون العذاب الأكبر لعلهم يرجعون)٣٢ /٢١. ﴿ولكن أكثرهم لا يعلمون﴾ بەلاٚم زۆربەيان نازانن ئەوسزايە.

### ئەى پيٚغەمبەر! خۆراگر بەو تەسبيحاتى خوا بكە:

﴿ ٤٨ واصبر لحكم ربك﴾ خۆگربە لەبەرامبەر بەجيٚهيٚنانى بريارەكانى پەروەردگارتەوە ئەى موحەممەد! ﷺ بە ويٚلٚكردنيان ﴿فإنك بأعيننا﴾ چونكە بەراستى تۆ لەبەرچاوديٚرى ئيٚمەدايت, فيٚلٚيان زيانت لىٚنادات ﴿وسبح بحمد ربك حين تقوم﴾ كاتىٚ هەلٚئەسيت هەردەم تەسبيحات و سوپاسگوزاريى پەروەردگارت بكە، ئيمامى (ترمذى و نسائى) ئەلٚيٚن: كاتىٚ لەجيٚگايەكدا هەلٚدەسيت,خويٚندنى (ذكر)ى ((سبحانك اللهم وبحمدك أشهد أن لا إله إلا أنت، أستغفرك وأتوب إليك)) سوننەتە. ﴿ ٤٩ ومن الليل فسبحه وإدبار النجوم﴾ وەلەشەوگارييشدا نويٚژى مەغريب وعيشاى بۆ بكە,وەكاتيٚكيش ئەستيٚرەكان پشت هەلٚ ئەكەن و وندەبن, دووركاتى سوونەتى بەيانى بكە، واتە: هەم لەشەوگارداو، هەم لە نويٚژى بەيانيدا ستايش و تەسبيحاتى خوا بلىٚ, (ئيبن عەباس) دەلٚيٚت: مەبەست دوركاتەكەى پيٚش نويٚژى بەيانيە، چونكە پيٚغەمبەر ﷺ هەميشە پيٚش نويٚژى بەيانى دوو ركات نويٚژى سوونەتى دەكرد.

كۆتايى تەفسيرى سوورەتى (طور).

*** *** ***

## ٥٣- سوورەتى (نەجم)ـە

## مەككەييەو (٦٢) ئايەتە

### بەناوى خواى بەخشندەى ميهرەبان

ئەميش وەك سوورەتە هاوشيٚوەكانى خۆى باسى بيروباوەرە بنەرەتييەكان دەكات: يەكخواپەرستيى، پەيامەكەى پيٚغەمبەر، زيندوو بوونەوە، پاداشت وتۆلٚە، جا بۆ يەكەمجار باسى بلٚندبوونەوەو (ميعراج)ـەكەى پيٚغەمبەر ﷺ ئەكات، كەبەراستيى رووداويٚكى گەورەو گرنگى ميٚژووييە، چونكە جگە لەبينينى هەمووسەيرو سەمەرەكانى تر لەوشەوەدا، بەچاوى سەريش چەندين شتى سەرسورهيٚنەرى ترى چاوپيٚكەوت، پاشان باسى ئەوبتانە ديٚت كە بتپەرستەكان ئەيانپەرستن، لەگەلٚ پووچەلٚكردنەوەى كارەكەيان، ئينجا باسى پاداشت ديٚت كەچۆن هەموو كەسيٚك بەپيٚى كاروكردارى خۆى رەفتارى لەگەلٚ ئەكرىٚ، دواتر ئەلٚيٚت: هەمووكەس بەپيٚى كارو كردەوەى خۆى پاداشت ئەدريٚتەوەو كەسيش گوناهى كەس هەلٚناگرىٚ.. هەندىٚ بەلٚگەش ديٚنيٚتەوە بۆدەسەلاٚتى خوا بۆمراندن و زيندوو بوونەوە.

### سويٚند بەمانە موحەممەد هەرچى دەلٚىٚ راستە:

﴿بسم الله الرحمن الرحيم * ١ والنجم إذا هوى﴾ سويٚند بەو ئەستيٚرەيە كەبەخيٚرايى ئاوا دەبيٚت، يالەشويٚنى خۆى دەترازيٚت و بەرديٚتەوە كاتى نزيكبوونەوەى قيامەت ﴿ ٢ ماضل صاحبكم وماغوى﴾ هاوەلٚەكەى ئيٚوە (موحەممەد)ﷺ لەرِيٚى هەق لاينەداوەو باوەرِى پووچيشى نەبووە.

**موحەممەد لە خۆیەوە قسە ناکات:**

﴿٣ وما ينطق عن الهوى﴾ وە قسەوگوفتاری (پێغەمبەر) لەڕووی هەواوهەوەسەوە نیە،جاکەسێ ئاوابێ چۆن ڕێگە ون ئەکات؟! ﴿٤ إن هو إلا وحي يوحى﴾ ئەو قورئانەی کە ئەودەیلێت ,جگە لەوە کەبە وەحیی بۆی دەنێرێ، هیچیتر نیە ,واتە: ئەم قورئانە هەر لەلایەن خواوەیە.

**مامۆستای ڕەسولی ئەمین، جوبریلی ئەمینە:**

﴿٥ علمه شديد القوى﴾ خاوەن هێز وبە زەبر (جوبریل)ی فریشتەیە، قورئانی فێرکردووە، بەڵێ زۆر بەهێزە، دەستپاکە، زمان پاکە، دەسائیتر ئێوە چۆن ئەڵێن قورئان ئەندێشەو خورافەی پێشووەکانە؟! ﴿٦ ذو مرة فاستوى﴾ خاوەن مەتانەت لە ژیریی‌و هۆشدا، جا لەسەر ئەوشێوەیەی خوا دروستیکردووە زۆر بەڕێك وپێکی وەستاو خۆی نیشاندا ﴿٧ وهو بالأفق الأعلى﴾ وە خۆی لە ئاسۆیەکی زۆربەرزو بڵند (لەئاسۆی خۆردا) نیشانی پەیامبەردا ﷺ. بەڵێ.. جبریل هەندێ جار لەسەر شێوەی ئادەمیدا دەهات و، پەیامبەریش ﷺ چاوی پێدەکەوت، پەیامبەر ﷺ زۆرحەزی ئەکردکە جوبریل لە شێوە فریشتەکەدا ببینێ، بۆیە ئەویش دووجار لەسەر شێوە فریشتەییەکەی خۆی نیشاندا، جارێ لەسەر زەویی، جارێکیش لەئاسماندا. جارەکەی سەر زەویی ئەوکاتە بوو کەلەئەشکەوتی (حیراء)دا بوو، جا لەخۆرهەلاتی ئەشکەوتەکەوە هات وبەریخۆری لێگرت، ئەوەیە کە ئەفەرموێ: (وهو بالأفق الأعلى) جارەکەی ئاسمانیش لەلای (سدرة المنتهى)دا بوو. ﴿٨ ثم دنا فتدلى﴾ لە پاشانزیك بووەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ،ئینجا خۆی داهێڵا ﴿٩ فكان قاب قوسين اوادنى﴾ جائەوەندە لێی نزیك بووەوە بەئەندازەی دووکەوان، یان کەمتر بوو ,دیارە لەناوعەرەباندا باوبووەوتویانە: ئەوەندە بەیەکەوە نزیکن ئەندازەی دووکەوان، یان کەمتر بەینیانە ﴿١٠ فأوحى إلى عبده ما اوحى﴾ ئینجا خوا لەڕێگەی ئەوەوە وەحیی کرد بۆبەندەی خۆی(موحەممەد)ﷺ ئەوەی کە دەبوو وەحیبکا.

الجزء السابع والعشرون — سورة النجم

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلنَّجْمِ إِذَا هَوَىٰ ﴿١﴾ مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمْ وَمَا غَوَىٰ ﴿٢﴾ وَمَا يَنطِقُ
عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ﴿٣﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ﴿٤﴾ عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلْقُوَىٰ ﴿٥﴾
ذُو مِرَّةٍ فَٱسْتَوَىٰ ﴿٦﴾ وَهُوَ بِٱلْأُفُقِ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٧﴾ ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّىٰ ﴿٨﴾
فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ ﴿٩﴾ فَأَوْحَىٰٓ إِلَىٰ عَبْدِهِۦ مَآ أَوْحَىٰ ﴿١٠﴾
مَا كَذَبَ ٱلْفُؤَادُ مَا رَأَىٰٓ ﴿١١﴾ أَفَتُمَٰرُونَهُۥ عَلَىٰ مَا يَرَىٰ ﴿١٢﴾ وَلَقَدْ رَءَاهُ
نَزْلَةً أُخْرَىٰ ﴿١٣﴾ عِندَ سِدْرَةِ ٱلْمُنتَهَىٰ ﴿١٤﴾ عِندَهَا جَنَّةُ ٱلْمَأْوَىٰٓ ﴿١٥﴾
إِذْ يَغْشَى ٱلسِّدْرَةَ مَا يَغْشَىٰ ﴿١٦﴾ مَا زَاغَ ٱلْبَصَرُ وَمَا طَغَىٰ ﴿١٧﴾ لَقَدْ رَأَىٰ
مِنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِ ٱلْكُبْرَىٰٓ ﴿١٨﴾ أَفَرَءَيْتُمُ ٱللَّٰتَ وَٱلْعُزَّىٰ ﴿١٩﴾ وَمَنَوٰةَ
ٱلثَّالِثَةَ ٱلْأُخْرَىٰٓ ﴿٢٠﴾ أَلَكُمُ ٱلذَّكَرُ وَلَهُ ٱلْأُنثَىٰ ﴿٢١﴾ تِلْكَ إِذًا قِسْمَةٌ
ضِيزَىٰٓ ﴿٢٢﴾ إِنْ هِىَ إِلَّآ أَسْمَآءٌ سَمَّيْتُمُوهَآ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ
ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَٰنٍ ۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَمَا تَهْوَى ٱلْأَنفُسُ ۖ
وَلَقَدْ جَآءَهُم مِّن رَّبِّهِمُ ٱلْهُدَىٰٓ ﴿٢٣﴾ أَمْ لِلْإِنسَٰنِ مَا تَمَنَّىٰ ﴿٢٤﴾ فَلِلَّهِ
ٱلْءَاخِرَةُ وَٱلْأُولَىٰ ﴿٢٥﴾ ۞ وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ لَا تُغْنِى
شَفَٰعَتُهُمْ شَيْـًٔا إِلَّا مِنۢ بَعْدِ أَن يَأْذَنَ ٱللَّهُ لِمَن يَشَآءُ وَيَرْضَىٰٓ ﴿٢٦﴾

٥٢٦ إِنَّ ٱلَّذِينَ

**ئەرێ پێغەمبەر شەوی ئیسرا خوای خۆی دی:**

﴿١١ ما كذب الفؤاد ما راى﴾ ئەوەی بەچاوی سەربینی, ناخ و دەروونی خۆی بەدرۆی دەرنەکرد، واتە: کاتێ کە بەچاو جوبریلی دی، دڵیشی باوەڕیکرد ﴿١٢ افتمارونه على مايرى﴾ ئایا ئێوە شەڕە قسەی لەگەڵ دەکەن لە سەر ئەوەی بینیتی لەشەو ڕەویی‌و میعراجدا باوەڕناکەن؟! ﴿١٣ ولقد رآه نزلة اخرى﴾ وە بێگومان پەیامبەر ﷺ جارێکی تریش لەدابەزینێکی تردا جوبرەئیلی دیتووە لە شێوەی خۆیدا. ڕاڤەکارانی قورئان قسەیان جیاوازە سەبارەت بەوەی کە ئایا پەیامبەر ﷺ خوای خۆی بەچاوی سەر دیتبێ؟ ئایا جوبرەئیلی لە سیمای خۆیدابەچاوی

سەردیتبیّ؟ وە دەستەی سوننەت وجەماعەتیش هەروا لەناو یەکتردا قسەیان جیاوازە، تەنانەت هاوەڵانیش یەك دەنگ نین! (ئیبن عەباس و عیکرەمەو ئەبو زەڕو کەعبولئەحبار) رایان وایە: پێغەمبەرﷺ بەچاوی سەرلەشەوی میعراجدا خوای دیتوە، بۆیە (ئیبن عەبباس) ئەڵێت: (إن الله اصطفى إبراهيم بالخلة، واصطفى موسى بالكلام، واصطفىمحمدا بالرؤية). واتە: خوا ئیبراهیمی بە(خەلیل) هەڵبژاردووە، موساش بەقسە لەگەڵکردن، موحەمەدیش ﷺ بەنیشاندانی خۆی و دیتنی بەچاوی سەر. (عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود و خاتوو عائیشە)-خوا لەهەموویان رازیی- نکوڵیی وئینکاری ئەودیتنەیە ئەکەن، تەنانەت خاتوو عائیشە ئەڵێت: هەرکەسێ پێی وابێت کە موحەممەدﷺ بە چاویخۆی خوای دیتوە، ئەوە درۆیەکی گەورەی لەسەر خوا هەڵبەستووە، چونکە خوا ئەفەرموێ: (لا تدركه الأبصار و هو يدرك الأبصار وهو اللطيف الخبير)، وە دەڵێت پێغەمبەر ﷺ دووجار جوبریلی دیتووە، جارێ لەئاسمانەوە هاتە خوارێ، جارێکی دی بەشەش سەد باڵەوە لەلای (سدرة المنتهى)دا. ئەم ئایەتانەی سورەتی (نجم)ە بەڵگە نین لەسەر ئەوەی کەپەیامبەر ﷺ خوای خۆی بەچاوی سەر دیتبێ، چونکە باسەکە لەجوبرەئیلەوە دەست پێئەکات و، راناوە (ضمیر)ەکان:(علمه شديد القوى)،(ولقد رآه نزلة أخرى) بۆ جوبرەئیل دەگەڕێنەوە، بەڵام پێشەوا (ئەحمەد) ئەڵێت: لەشەوی میعراجدا پەیامبەر ﷺ خوای خۆی بەچاوی سەردیتوە. بەندەش وتەکەی (عائیشەو ئیبن مەسعوود) بە بەهێزتر دەزانم ئەزانم، وەك (لالەکائی)یش لەقسەکانیدا هەر ئەوە هەڵئەبژێرێ، بەڵام ئەگەر لەم باسەدا (توقف) بکرێ وادەزانم چاکترە، چونکە بەڵگەیەکی قسەبڕو راشکاو نیە (والله أعلم) ﴿[14] عند سدرة المنتهى﴾ جاری دووەمیش لە لای (سدرة المنتهى)دا، کە (سیدرەش) لە ئاسمانی حەوتەمدایەو نزیکی عەرشەو درەختێکی پڕگەڵاو سێبەرخەست و چڕو پڕە، فریشتەو گیانی شەهیدان و مەودای زانیاریی پەیامبەران بێجگە لە موحەممەد ﷺ تا ئەوێ ئەڕوات، جوبرەئیلیش لە سەفەرەکەی شەوی میعراجدا هەتا ئەوێ لەگەڵ پێغەمبەردابوو، لەوێ بەولاوە تەنها خوا خۆی ئەزانێ... پێشەوا موسلیم لەباسی شەوڕەوییدا فەرموودەیەکی درێژی هێناوە، لە بەشێکیدا ئەڵێت: ((ثم ذهب بى إلى سدرة المنتهى، وإذا ورقها كآذان الفيلة، وإذا ثمرها كالقلال..)) مسلم: ١٤٦/١. فتح البارى ٣٤٩/٦. ﴿[15] عندها جنة المأوى﴾ لە لایەتی بەهەشتی (جێی دانیشتن و حەوانەوە)، خوا خۆی ئەزانێ ئەو بەهەشتە کام بەهەشتەیە، هەرچەند (تەبەریی) ئەڵێت: ئەو بەهەشتەیە کەجێگای شەهیدانە.

**نووری خواو، حەشامەتی فریشتە ( سیدرە )یان پۆشی:**

﴿[16] إذ يغشى السدرة ما يغشى﴾ ئەوکاتەی دیتی، سیدرەی داپۆشی ئەو شتەی دایئەپۆشی، واتە: لەکاتی دیدارەکەدا نووری خواو،فرەزۆری فریشتەکان سیدرەیان پڕکرد ﴿[17] ما زاغ البصر وما طغى﴾ وە چاوی پێغەمبەر کلا نەبوو لەوەی دیتی، تەجاوزیشی نەکرد لەوەی بۆی دیاریکرابوو، بەڵکو هەر تەماشای ئەوەی دەکرد ﴿[18] لقد رأى من آيات ربه الكبرى﴾ بەراستی پێغەمبەر ﷺ گەلێك بەڵگەو نیشانەی گەورە گەورەی پەروەردگاری خۆی لە سەفەرەکەیدا - وەك (سدرة المنتهى) و (بيت المعمور) وبەهەشت و دۆزەخ و..هتد-بینی.

**لات و عوززا و مەنات،کردووتاننە خوا!بنەمایەکیان نیە:**

پاش باسکردنی ئەو هەموو شتانەی کەپەیامبەر ﷺ چاوی پێکەوتن لەمیعراجدا، ئینجا بەهاوبەش پەیداکەرەکان ئەفەرموێت: ﴿[19] افرأيتم اللات والعزى* [20] و منات الثالثة الأخرى﴾ هەواڵی لات وعوززاو سێیەمەکەی تریان (مەنات)م بدەنێ ئایا کچی خوان ئەی خوانەناسان؟! ئەوانە سێ بتەکە بوون لە (طائیف و

غەطفان و مەککە)دا ئەپەرستران ﴿ ٢١ الكم الذكر وله الأنثى﴾ ئایا نێرینەتان بۆ خۆتان هەڵبژاردووەو،بۆ خواش مێینە؟! جاریٚ خوا هەرپێویستی بەمندالٚ نیە، گریمان ئەگەر پێوستیشی بێت، کامیان باش بیٚ بەلاتانەوە دایئەنێن بۆخۆتان و کامیشتان بەلاوە خراپ بیٚ ئەیدەن بەخوا! ﴿ [٢٢] تلك إذا قسمة ضيزى﴾ ئەگەر ئاوابیٚ ئەوە بەش کردنێکی ستەمکارانەیە. ئینجا خوای کارزان ئینکاری و بێزاری لەسەر ئەو حاڵەتە خراپەیان دەر ئەبڕیٚ:﴿ [٢٣] إن هي إلا أسماء سميتموها أنتم وآباؤكم﴾ ئەوانە "لات وعوزاومەنات" هەر چەند ناوێکن خۆتان وباوانەکانتان ناوتان لێناون، ئەگینا هیچ حەقیقەت و ناوەڕۆکێکیان نیە ﴿ ماأنزل الله بها من سلطان﴾ وخواش هیچ بەڵگەیەکی بۆ پەرستنیان دانەبەزاندووە ﴿ إن يتبعون إلا الظن وما تهوى الأنفس﴾ ئەوانە هەر شوێنی گومان دەکەون , ئەگینا هیچ بەڵگەو نیشانەیەکیان بە دەستەوە نیە بۆ پەرستنیان ﴿ ولقد جاءهم من ربهم الهدى﴾ لەکاتێکدا بەحەقیقەت لەلایەن پەروەردگاریانەوە ڕێنوێنیان بۆ هاتووە،واتە: قورئانیان بۆ هاتووە کە ڕێنوێنی دەکا بۆ یەکخواپەرستی.

**چاکە تەنیا بە ئارەزووو تەمەننا دەست ناکەویٚ:**

﴿ [٢٤] أم للإنسان ما تمنى﴾ ئاخۆ بۆ هەرمرۆیەکی کافر هەرچی بخوازیٚ هەیە؟! واتە:کەئەوان پێیان وایە دوارۆژ پەرستراوەکانیان فریایان دەکەون و تکایان بۆ ئەکەن, بیر لە شتیوا نەکەنەو هەرگیزیش نابیٚ ﴿ [٢٥] فلله الآخرة والأولى﴾ چوون ئاخیرەت ودنیا ,هەر بۆ خوای هەق(الله)یە ,نەک بۆ غەیری ئەو, لەبت وخواکانیان تابتوانن شەفاعەت بۆ پەرستیارەکانیان بکەن.

**تکاو شەفاعەت مەر خوا ئیزن بداو رازیی بیٚ:**

﴿ [٢٦] وكم من ملك في السموات﴾ فریشتەیەکی زۆرلە ئاسمانەکاندا هەن ﴿ لا تغنى شفاعتهم شيئا﴾ تکایان هیچ کەڵك نابەخشیٚ بۆ پەرستیارەکانیان، مەگەر ئەو بتانەی ئێوە چۆن تکایان وەرئەگیردریٚ بۆتان؟! ﴿ إلا من بعد أن يأذن الله لمن يشاء ويرضى﴾ مەگەر پاش ئەوەی بۆ هەرکەسێك خوا خۆی بیەویٚ و رازی بیٚ مۆڵەت بدات فریشتە تکای بۆبکات، ئەوەش بۆ پیاوە راساڵ و صاڵحەکان دەبێت.

سُورَةُ النَّجْمِ — الجزء السابع والعشرون

إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ لَيُسَمُّونَ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةَ تَسْمِيَةَ ٱلْأُنثَىٰ ﴿٢٧﴾
وَمَا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ ۖ وَإِنَّ ٱلظَّنَّ لَا يُغْنِى مِنَ
ٱلْحَقِّ شَيْـًٔا ﴿٢٨﴾ فَأَعْرِضْ عَن مَّن تَوَلَّىٰ عَن ذِكْرِنَا وَلَمْ يُرِدْ إِلَّا ٱلْحَيَوٰةَ
ٱلدُّنْيَا ﴿٢٩﴾ ذَٰلِكَ مَبْلَغُهُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ ۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن
سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ ٱهْتَدَىٰ ﴿٣٠﴾ وَلِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَا
فِى ٱلْأَرْضِ لِيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ أَسَـٰٓـُٔوا۟ بِمَا عَمِلُوا۟ وَيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟
بِٱلْحُسْنَى ﴿٣١﴾ ٱلَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَـٰٓئِرَ ٱلْإِثْمِ وَٱلْفَوَٰحِشَ إِلَّا ٱللَّمَمَ ۚ
إِنَّ رَبَّكَ وَٰسِعُ ٱلْمَغْفِرَةِ ۚ هُوَ أَعْلَمُ بِكُمْ إِذْ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ
وَإِذْ أَنتُمْ أَجِنَّةٌ فِى بُطُونِ أُمَّهَـٰتِكُمْ ۖ فَلَا تُزَكُّوٓا۟ أَنفُسَكُمْ ۖ هُوَ أَعْلَمُ
بِمَنِ ٱتَّقَىٰٓ ﴿٣٢﴾ أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى تَوَلَّىٰ ﴿٣٣﴾ وَأَعْطَىٰ قَلِيلًا وَأَكْدَىٰٓ
﴿٣٤﴾ أَعِندَهُۥ عِلْمُ ٱلْغَيْبِ فَهُوَ يَرَىٰٓ ﴿٣٥﴾ أَمْ لَمْ يُنَبَّأْ بِمَا فِى صُحُفِ
مُوسَىٰ ﴿٣٦﴾ وَإِبْرَٰهِيمَ ٱلَّذِى وَفَّىٰٓ ﴿٣٧﴾ أَلَّا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ
﴿٣٨﴾ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَـٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴿٣٩﴾ وَأَنَّ سَعْيَهُۥ سَوْفَ
يُرَىٰ ﴿٤٠﴾ ثُمَّ يُجْزَىٰهُ ٱلْجَزَآءَ ٱلْأَوْفَىٰ ﴿٤١﴾ وَأَنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ ٱلْمُنتَهَىٰ
﴿٤٢﴾ وَأَنَّهُۥ هُوَ أَضْحَكَ وَأَبْكَىٰ ﴿٤٣﴾ وَأَنَّهُۥ هُوَ أَمَاتَ وَأَحْيَا ﴿٤٤﴾

٥٢٧

**موشریکەکان کچان دەکەنە منداڵی خوا!:**

﴿ [٢٧] إن الذين لا يؤمنون بالآخرة﴾ بێگومان ئەوانەی باوەڕیان بەپاشە ڕۆژ نیە و پێیان وایە زیندوو بوونەوەو لێپرسینەوە نیە ﴿ ليسمون الملائكة تسمية الأنثى﴾ ناوی مێینە لە فریشتەکان دەنێن! واتە: ئەڵێن فریشتە کچیخوان ﴿ [٢٨] وما لهم به من علم﴾ ئەوان هیچ زانیارییەکیان بەوتەکەیان نیە ﴿ إن يتبعون إلا الظن﴾ بەڵکو هەردوای گومانی نارەواو پووچ دەکەون ﴿ وإن الظن لا يغنى من الحق شيئا﴾ لەکاتێکدا گومانیش مرۆڤ لەڕاستیبی بیٚ نیاز ناکاو جێی حەقیقەت ناگرێتەوە.

**لەئەهلی باتڵ و ناهەق واز بێنە:**

﴿[٢٩] فاعرض عن من تولى عن ذكرنا ولم يرد إلا الحياة الدنيا﴾ جا کەوابوو پشت هەڵکە لەوەی ڕووی وەرچەرخاندووە لە (قورئان)ی ئێمەو ,جگە لەژیانی ئەم دونیایەش هیچی تری ناوێ ﴿[٣٠] ذلك مبلغهم من العلم﴾ ئەوە ئەوپەڕی زانیارییانە کە دنیایان هەڵبژاردووە بە سەرئاخیرەتدا!! ﴿إن ربك هو اعلم بمن ضل عن سبيله﴾ بێگومان پەروەردگاری تۆ زاناترە بەحاڵی ئەوکەسەی لەڕێگەی خوا لایداوە ﴿وهو اعلم بمن اهتدى﴾ هەر ئەویش زاناترە بەحاڵی ئەو کەسەی کەڕێگای ڕاستی هەڵبژاردووە، هیدایەت و ڕێنوێن بووە، بەپێی کردەوەکانیشیان پاداشت وەردەگرنەوەو تۆڵە دەدرێن ﴿[٣١] ولله ما فىالسموات وما فى الأرض﴾ هەر بۆخوایە چی لەئاسمانەکان وچی لە زەویدایە , واتە:هەرچییان تێدایە موڵك ودروستکراوی ئەوە ﴿ليجزى الذين أساءوا بما عملوا﴾ تالە پاشە ڕۆژدا پاداشی بەدکاران بداتەوە بەکارەکانیان ﴿ويجزى الذين احسنوا بالحسنى﴾ و پاداشتی چاکەکارانیش بداتەوە بە پاداشتێکی چاکتر.

**موسڵمان لە گوناهی مەزن و کاری دزێو خۆ بەدووردەگرێت:**

﴿[٣٢] الذين يجتنبون كبائر الإثم والفواحش إلا اللمم﴾ ئەوانەی کەخۆیان بەدووردەگرن لە گوناهەگەورەکان وکارەدزێوەکان, بەڵام وردە گوناهی بچووك خوا دەیانبووری ﴿إن ربك واسع المغفرة﴾ بێگومان پەروەردگاری تۆ ئەی موحەممەد!ﷺ لێبوردنی زۆر و فراوانە ﴿هو اعلم بكم إذ انشاكم من الأرض﴾ ئەو بەهەموو کارو بارتان لەخۆتان زاناترە, کاتێ دروستیکردوون لەزەویی ﴿وإذ انتم اجنة فى بطون امهاتكم﴾ وە کاتێ کۆرپەلە بوون لەسکی دایکتاندا ﴿فلا تزكوا انفسكم﴾ جا کەوابوو پاکانە بۆخۆتان مەکەن و، خۆتان هەڵ مەکێشن ﴿هو اعلم بمن اتقى﴾ ئەو زاناترە بەو کەسەی خۆی دەپارێزێ و سنوورەکانی نابەزێنێ.

**ئەوی گوێ بیست نابێ و، چکوش دەکا موسڵمان نییە:**

﴿[٣٣] افرايت الذى تولى﴾ ئایا ئەوکەسەت دیت ڕووی لە شوێنکەوتنی ئیسلام وەرچەرخاند, پاش ئەوەی ویستی شوێنیکەوێ ﴿[٣٤] واعطى قليلا واكدى﴾ و هکەمێك لەسامانی بەخشێ و دەستی گرتەوە؟! ﴿[٣٥] اعنده علم الغيب فهو يرى﴾ ئایا ئەو کەسە زانستی غەیبی لایە ,وائەبینێ کە غەیری خۆی سزای دوارۆژیلە سەر هەڵدەگرێ؟! گوتراوە: ئەوکەسە(وەلیدیکوڕی موغیرە) بووە.

**ڕووپەڕەکانی مووسا و ئیبراهیم:**

﴿[٣٦] أم لم ينبأ بما فى صحف موسى﴾ ئایاهەواڵی پێنەدراوە بەوەی لە سفرەکانی موسا ﴿[٣٧] وإبراهيم الذى وفى﴾ وصوحوفی (ئیبراهیم)ی وەفاداردا هاتووە:﴿[٣٨] الا تزر وازرة وزر اخرى﴾ کە هیچ کەسێك گوناهی یەکێکی تر هەڵناگرێ، لەوە دەچێت ئەم کرین و فرۆشتنە (وەلید) کردبێتی، چونکە جارێکیان ویستی ئیمان و باوەڕ بێنێ، کەچی پیاوێك پەشیمانی کردەوەو وتی: بۆچی ئیمان دێنیت، ئەگەرشتێکم بدەیتێ من گوناهەکانت بۆ هەڵئەگرم!! ئەمیش لەبەرامبەر ئەوەوە بەڵێنی ئەندازەیەك ماڵ و سامانی دایە و، پاشانیش هەمووی نەدایەو قسەکەی خۆی نەبردە سەرو پەشیمان بوویەوە جابۆ خستنە پێش چاوی حەماقەتیوا,ئایەتی:(افرأيت الذى تولى..) هاتە خوارەوە﴿[٣٩] وان ليس للإنسان إلا ما سعى﴾ وبۆهیچ ئادەمیزادێك نیە پاداشتی کردەوەی خۆی نەبێ, ئەو کارانە نەبێ کاتی خۆی هەوڵی بۆداوەو کردوویەتی. پێشەوا (شافیعی ومالیك)–خوا لێیان ڕازی بێت– هەردوو لەم ئایەتەوە وەریان گرتووە کەپاداشتی قورئان خوێندن بەمردووان ناگا، ئەگەرچی "هەدیە"شی بۆبکەن، چونکە ئەوە

هەوڵ و كۆششی خۆی نییە، بەڵام پێشەوا (ئەحمەد) و دەستەیەكی تری زانایان ڕایان وایە كە: پاداشتی (قراءة) بە مردووان ئەگا، بەمەرجێ كە بەپارەوپووڵ نەخوێنرێ ﴿[٤٠] وان سعيه سوف يرى﴾ وبێگومان هەوڵ وكارەكەی لەدواییدا لەترازووەكەیدا دەبینرێت. (قال ابن أبی العز: إتفق أهل السنة:أن الأموات ينتفعون من سعی الأحياء بأمرين:

احدهما: مانسب إليه فی حياته.

الثانی: دعاء المسلمين و استغفارهم له. وأما الصدقة والحج على نزاع فيها يصل إليه من ثواب الحج. فعن محمد بن الحسن: انه إنما يصل الميت ثواب النفقة والحج للحجاج. وعند عامة العلماء: ثواب الحج للمحجوج عنه وهو الصحيح، واختلف فی العبادات البدنية: كالصوم والصلاة وقراءة القرآن والذكر. فذهب (أبو حنيفة وأحمد وجمهور السلف) إلى وصولها. والمشهور من مذهب الشافعی و مالك عدم وصولها، وذهب أهل البدع من أهل الكلام إلى عدم وصول شئ البتة، لاالدعاء ولاغيره، وقولهم هذا مردود بالكتاب والسنة. المحقق على كتاب شرح اصول اعتقاد اهل السنة و الجماعة, للدكتور أحمد بن سعد بن حمدان الغامدی- الاستاذ بقسم العقيدة- بجامعة أم القرى مكة المكرمة. ﴿[٤١] ثم يجزاه الجزاء الأوفى﴾ پاشان پاداشت دەدرێتەوە بەتەواوترینی پاداشت ,واتە: هیچ شتێكی لێكەم ناكرێتەوەوهەر بەپێی جۆری كردەوەی خۆشیەتی.

**هەندێ صیفاتی خوای بەبەزەیی:**

﴿[٤٢] وان إلى ربك المنتهى﴾ وەبەڕاستی سەرەنجامی هەموو ئیش وكارێ هەربۆلای پەروەردگارت ئەگەڕێتەوەو ورد ودرشت لەگەڵ ئادەمیزاد ئەكۆڵرێتەوە. ئیمامی (بوخاریی) لە (ئیبن عەباس)ەوە هێناویەتی: ((سجد النبی ﷺ بالنجم، وسجد معه المسلمون والمشركون والجن والإنس)) واتە: پێغەمبەر ﷺ سوورەتی (نەجم)ی خوێندو سوژدەی برد، وە هەروەها موسڵمانان و، هاوبەش دانەران و جنۆكەو ئادەمیش لە گەڵی سوژدەیان برد. ﴿[٤٣] وانه هو أضحك وأبكى﴾ وەبەڕاستیی هەر خوایە مرۆڤ دەكاتەپێكەنین و گریان ,وە هەمووخۆشیی و ناخۆشییەك بەدەستی ئەوە. ﴿[٤٤] وانه هو أمات وأحيا﴾ وەهەر ئەوە ئەمرێنێ و ئەژێنێ. ﴿[٤٥] وانه خلق الزوجين الذكر والأنثى﴾ بەڕاستی هەر ئەو زاتەیە كەجوتی نێر ومێی دروستكرد. ﴿[٤٦] من نطفة إذا تمنى﴾ لەئاوێكی‌كەم كاتێ لە پشتی پیاوو لەسینەی ئافرەتەوە هەڵدەقوڵێ ودەڕژێتە ناومنداڵدانەوە. ﴿[٤٧] وان عليه النشأة الأخرى﴾ بێگومان دروست كردنەوەكەی تر -دوای مردن- لەسەرخوایە ﴿[٤٨] وانه هو اغنى واقنى﴾ هەر ئەو زاتە كاربەجێیە هەندێ لە بەندەكانی دەوڵەمەند دەكاو,هەندیچكیش هەژار. ﴿[٤٩] وانه هو رب الشعرى﴾ وەهەر ئەوە پەروەردگاری ئەستێرەی شیعرا.

ئەستێرەی شیعرا: لەوەرزی زستانی ئێمەدا دەرئەكەوێ، بەڵام لەسەردەمی ئەستێرە ناسەكانی (مصر)ی كۆندا لەهەوەڵی هاوێندا دەركەوتووە، ئەم ئەستێرەیە خاوەن گۆیەكی گەورەیە، قەوارەكەی بیست ئەوەندەی گۆی خۆرە!! وەدوورییەكەشی وەك دووری خۆرە لەئێمەوە، بەڵكو بەزیادیشەوە, كە ئەوزیادەیە بەیەك ملیۆن بەراوردكراوە! ئەزانین كەخێرایی تیشك لە تەنها چركەیەك دا (٣٠٠) هەزار كیلۆ مەترە، دەی تیشكی خۆر لەبەر دوورییەكەی لەماوەی (٨) دەقیقەو (١٣) چركەدا ئەو جا ئەگاتە ئێمە، لەكاتێكا ,جیاوازی نێوانمان (١٥) ملیۆن كیلۆمەترە.. بەڵام شیعرا بە (١١٠) ساڵ ئەگات، جا ئەبێ ئەوئەندازەیە چەندبێ؟! ئەوئەستێرەیە" لەكاتی زۆرگەرمادا لەپشتی بورجی (جەوزا)وە هەڵدێت" بۆیەش بەتایبەت دەست نیشانی ئەوئەستێرەیە ئەكات، چونكە كاتی خۆی هەندێ لەتیرەكانی

عەرەب ئەیانپەرست. ﴿ وانه أهلك عادا الأولی ﴾ وە تەنهاهەر ئەوزاتەبوو گەلی عادی یەکەمی لەناوبرد هەرچەندە زۆر بەدەسەلات و بەتواناش بوون، کەچی کاتێ سەرپێچیان کرد لەپێغەمبەرەکەیان (هوود) خوالەناوی بردن. ﴿ وثمود فما أبقی ﴾ وەگەلی سەموودیشی لەناو برد کەسی لێ نەهێشتەوە. ﴿ وقوم نوح من قبل ﴾ وە پێش گەلی عادوسەمود، هۆزی نوحیشی لەناوبرد ﴿انهم کانوا هم أظلم و أطغی ﴾ چونکە بەڕاستیی ئەو گەلی نوحە ستەمکارترو سەرکێش تر بوو لەعادو سەموود ﴿ والمؤتفکة أهوی ﴾ وە هەروەها گوند و شارەکانی گەلی (لوط)یشی سەروو ژێر کرد ﴿ فغشاها ما غشی ﴾جا بە جۆراو جۆری سزای سەخت داپۆشین ﴿ فبأی آلاء ربك تتماری ﴾ جا کەوابوو لە چ نیعمەتێك لەنیعمەتەکانی پەروەردگارت گومانت هەیە.

سُورَةُ النَّجْمِ — الجزء السابع والعشرون

وَأَنَّهُۥ خَلَقَ ٱلزَّوْجَيْنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰ ﴿٤٥﴾ مِن نُّطْفَةٍ إِذَا تُمْنَىٰ ﴿٤٦﴾ وَأَنَّ
عَلَيْهِ ٱلنَّشْأَةَ ٱلْأُخْرَىٰ ﴿٤٧﴾ وَأَنَّهُۥ هُوَ أَغْنَىٰ وَأَقْنَىٰ ﴿٤٨﴾ وَأَنَّهُۥ هُوَ رَبُّ
ٱلشِّعْرَىٰ ﴿٤٩﴾ وَأَنَّهُۥٓ أَهْلَكَ عَادًا ٱلْأُولَىٰ ﴿٥٠﴾ وَثَمُودَا۟ فَمَآ أَبْقَىٰ ﴿٥١﴾
وَقَوْمَ نُوحٍ مِّن قَبْلُ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ هُمْ أَظْلَمَ وَأَطْغَىٰ ﴿٥٢﴾ وَٱلْمُؤْتَفِكَةَ
أَهْوَىٰ ﴿٥٣﴾ فَغَشَّىٰهَا مَا غَشَّىٰ ﴿٥٤﴾ فَبِأَىِّ ءَالَآءِ رَبِّكَ تَتَمَارَىٰ ﴿٥٥﴾
هَٰذَا نَذِيرٌ مِّنَ ٱلنُّذُرِ ٱلْأُولَىٰٓ ﴿٥٦﴾ أَزِفَتِ ٱلْـَٔازِفَةُ ﴿٥٧﴾ لَيْسَ لَهَا مِن
دُونِ ٱللَّهِ كَاشِفَةٌ ﴿٥٨﴾ أَفَمِنْ هَٰذَا ٱلْحَدِيثِ تَعْجَبُونَ ﴿٥٩﴾ وَتَضْحَكُونَ
وَلَا تَبْكُونَ ﴿٦٠﴾ وَأَنتُمْ سَٰمِدُونَ ﴿٦١﴾ فَٱسْجُدُوا۟ لِلَّهِ وَٱعْبُدُوا۟ ۩ ﴿٦٢﴾

سُورَةُ القَمَرِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱقْتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلْقَمَرُ ﴿١﴾ وَإِن يَرَوْا۟ ءَايَةً يُعْرِضُوا۟
وَيَقُولُوا۟ سِحْرٌ مُّسْتَمِرٌّ ﴿٢﴾ وَكَذَّبُوا۟ وَٱتَّبَعُوٓا۟ أَهْوَآءَهُمْ
وَكُلُّ أَمْرٍ مُّسْتَقِرٌّ ﴿٣﴾ وَلَقَدْ جَآءَهُم مِّنَ ٱلْأَنۢبَآءِ
مَا فِيهِ مُزْدَجَرٌ ﴿٤﴾ حِكْمَةٌۢ بَٰلِغَةٌ فَمَا تُغْنِ ٱلنُّذُرُ
﴿٥﴾ فَتَوَلَّ عَنْهُمْ يَوْمَ يَدْعُ ٱلدَّاعِ إِلَىٰ شَىْءٍ نُّكُرٍ ﴿٦﴾

خُشَّعًا أَبْصَٰرُهُمْ — ٥٢٨

**پێغەمبەریش هەر ترسێنەرێکە لە ترسێنەران:**

﴿ هذا نذیر من النذر الأولی ﴾ ئەمە (موحەممەد) ﷺ ترسێنەرێکە لەجۆری ترسێنەرەکانیپێشوو، واتە: ئەم یەکەم کەس نییە، بەڵکو گەلێك لەپەیامبەران پێش ئەمیش هاتوون ﴿ ازفت الآزفة ﴾ "قیامەت نزیك بۆتەوە ﴿ لیس لها من دون الله کاشفة ﴾ جگە لەخواش کەسێکی تر نییە کاتی هاتنی بەدیار بخا ,وەکو لەجێگایەکی تردا دەفەرموێ:(لایجلیها لوقتها إلا هو..) ئەعراف/١٨٧ ﴿ أفمن هذا الحدیث تعجبون ﴾ جا ئایائێوە لەم وتەیە "قورئان" سەرسام ئەبن؟! ﴿ وتضحکون ولا تبکون ﴾ و پێدەکەنن "لەکاتی بیستنیدا" و ناگرین "تاپەند و ئامۆژگاری پێ وەربگرن، ئەبوو وانەبوایە ﴿ وأنتم سامدون ﴾ وە بەردەوام ئێوە بێئاگاو سەرگەرم دەبن! ﴿ فاسجدوا لله واعبدوا ﴾ جا هەرتەنیا سوژدە بۆخوا بەرن, وەئەویش بپەرستن بەتەنیا, دەسا هەموو بە دڵسۆزانە کرنووش بەرن بۆخوا بیپەرستن و, هیچ کەسێك مەکەنە هاوبەشی, بەتایبەت (لات و عوززاو مەنات)تان.

لە (١٣) شەعبانی (١٤١٧)ك بەرامبەر بە ١٩٩٦/١٢/٢٣ لە شاری (مەریوان) لەتەفسیری ئەم سوورەتە بوومەوە.

والحمدلله رب العالمین.

*** *** ***

## ٥٤- سوورەتی (قەمەر)ـە

مەککەییەو (٥٥) ئایەتە، جگە لەئایەتی (٤٤)

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

بەم موعجیزە گەورەوگرنگەیە: (واتە: لەتبوونی مانگ) لەسەر داوای بتپەرستەکان دەس پێئەکات وچارەسەری بیرو باوەڕی جاهیلی دەکات، لەدوای سورەتی (الطارق)ـەوە هاتۆتە خوارەوە.پاشان باسیڕۆژی دوایی دەکا،

تابەشکو خوانەناسان داچڵەکێن، وە هەروەها دوای باسی بێ بڕواکانی مەککە، باسێکی بێ بڕوایانی گەلانی پێشوویش دەکا، ئینجا باسی تاغووت و ملهووڕەکان و دەرەنجامیان دەکا.. پاشان بەبێبڕواکانی مەککە ئەڵێت: هۆشیاربن! ئەگینا ئەوەی دووچاری ئەوان بوو، یەخەی ئێوەش دەگرێ، لەفەرموودەیەکا – ئەبو واقید هێناویەتی – هاتووە: پێغەمبەر ﷺ لەنوێژی جەژنەکاندا، هەروەها لەبۆنە گشتیەکاندا سوورەتی (قاف)و (اقتربت الساعة)ی دەخوێند.

**قیامەت نزیك بوویەو مانگیش بوو بە دوو کەرتەوە:**

﴿بسم الله الرحمن الرحيم * [١] إقتربت الساعة وانشق القمر﴾ ڕۆژی قیامەت نزیك بۆتەوە، مانگیش لەتبوو، گەلێکی زۆر لە ڕاڤەکەرانی قورئان رایان وایە کە مانگ لەسەر داوای ئەوانە لەت بوو و بەچاوی سەریش بینیان، ئەمەیش پێنج ساڵ پێش کۆچکردن بوو بۆمدینە، بۆ ئەمەیش (بوخاریی وموسلیم) لەکتێبەکانی خۆیاندا هێناویانە کە: مەککەییەکان داوایان لەپەیامبەر ﷺ کرد کە نیشانەیەکی ڕاستیی خۆییان نیشان بدات، ئەویش مانگی بۆلەت کردن! بەشێوەك کە ئەشکەوتی (حیرا)یان لە نێوان هەردوو پارچەکەیدا دیت، لەگەڵ ریوایەتیتردا هاتووە: ((انشق القمر على عهد رسول الله ﷺ فرقتين، فرقة على الجبل، وفرقة دونه، فقال رسول الله ﷺ اشهدوا)). واتە: لەسەر دەستی پێغەمبەری خوادا ﷺ مانگ لەتبوو و بوو بەدوو پارچە، بەشێکی کەوتە سەرکێوەکەو، ئەویکەشی کەوتە خوارەوەی، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئێوە شایەدبن و ببینن. (سەید قوتب) ئەڵێت: ئەم ڕووداوە بەچەندین ریوایەت لەگەڵ دیاریی کردنی جێگاوکات وشکڵیدا.. دانی پێدا نراوەو، بێ بڕواکانیش نەیانتوانی بەدرۆی بخەنەوە، جاکەوابوو ئەبێ بووبێ، ئەگینا ململانییان دەکرد، چونکە لەوکاتەدا تەنها ئەوەندەیان وت: کە جادووی لێکردووین..!! وە هەروەها (اقترب للناس حسابهم وهم في غفلة معرضون) (١/٢١) پشتگیری نزیکبوونەی ئەو ڕۆژی قیامەتە دەکا. پێشەوا (ئەحمەد) لە (سەهل)ەوە هێناویەتی کەپێغەمەر ﷺ دەفەرموێ:((بعثت أنا والساعة هكذا)) هەر ئەوکاتە کەمن کرامە پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ قیامەتا وەکوپەنجەی شایەدومان وپەنجەی ناوەڕاست (السبابة والوسطى) بووم. واتە: ئەوەندە لەیەکەوە نزیك بووین.

**بتپەرستەکان ڕوو لە نیشانەو موعجیزەکان وەردەگێڕن!:**

﴿[٢] وإن يروا آية يعرضوا﴾ وە ئەگەر هەربەڵگەو نیشانەیەك ببینن کە:بەڵگە بێ لەسەرڕاستیی‌پێغەمبەر, پشت هەڵدەکەن و گوێی نادەنێ ﴿ويقولوا سحر مستمر﴾ و ئەڵێن ئەمە جادوویەکی هەمیشەیی‌و هەموو کاتیە. ﴿[٣] وكذبوا واتبعوا أهواءهم﴾ پەیامبەریان بەدرۆزن زانی و، دوای هەواوهەوەسی خۆیان کەوتن ﴿وكل أمر مستقر﴾ وەهەموو کارێك لەچاك و خراپ کاتێکی بۆ هەیە قەراری تێدادەگرێت ﴿[٤] ولقد جاءهم من الأنباء مافيه مزدجر﴾ سوێند دەخۆم بێگومان ئەوەندە هەواڵی تیاچوونی ستەمکارانیان بۆهاتووەبیانگێڕێتەوە لە شیرك ﴿[٥] حكمة بالغة﴾ ئەم قورئانەش حیکمەتێکی تێرو تەواوە گەیشتۆتە ئەوپەڕی تێرو تەواوی لە حیکمەتدا ﴿فما تغن النذر﴾ جا چ کەڵکێ دەبەخشێ ترسێنەرەکان کاتێ باوەڕنەهێنن وکەڵك وەرنەگرن لەقورئان و لەپەیامبەر ﷺ، چونکە گوێی خۆیانیان کەڕکردووە، چاوی خۆیانیان لەئاستی هەقوو راستیی کوێر کردووە، وەك ئەم ئایەتەیش دەفەرموێ: (وما تغني الآيات والنذر عن قوم لا يؤمنون) (١٠/٣١).

**خوانەناسان ڕۆژی بەرێ حاڵیان بەدحاڵە:**

﴿٦ فتول عنهم﴾ جا کەوابوو پشتیان لێهەڵ بکە ئەی موحەممەد! ﷺ دەمەقاڵێیان لەگەڵ مەکە ﴿یوم یدع الداع إلى شئ نكر﴾ چاوەڕێی ئەو ڕۆژە بکە کە جاڕچیەکە (واتە:ئیسرافیل) بانگی خەڵك دەکات بۆشتێکی بێزراوو ناخۆش ونالەبار، چونکە پڕەلەئێش وئازار وخەم وخەفەت ﴿٧ خشعاً ابصارهم﴾ چاویان شۆڕەو ناتوانن هەڵیبڕن لەبەر سامناکی ئەوڕۆژە ﴿یخرجون من الأجداث﴾ لەوڕۆژەدا لە گۆڕ دێنەدەرەوە ﴿كأنهم جراد منتشر﴾ لە زۆرییدا دەڵێی کوللەی بڵاوەبوون ﴿٨ مهطعین إلى الداع﴾ بەخێرایی دەچن بۆلای جاڕ چیەکەو لەترساندا دواناکەون ﴿یقول الكافرون هذا یوم عسر﴾ کافرو بێباوەڕەکان ئەڵێن: ئەمڕۆ ڕۆژێکی‌سەختە ,دیارە تەنها بۆ ئەوان سەختە، نەك بۆباوەڕدارەکان, وەك ئەم ئایەتە ئەفەرموێ: (فذلك یومئذ یوم عسیر، علی الکافرین غیر یسیر) (٧٤/٩-١٠).

**سەرگوروشتەی هۆزەکەی نووح عیبرەتی تێدایە:**

ئینجا بۆ دڵنەوایی پەیامبەر ﷺ گەلێك لەئەزیەت وئازاری گەلانی پێشوو دێنێ، وەك ئەفەرموێ: ﴿٩ كذبت قبلهم قوم نوح﴾ پێش (قورەیش)، (گەلی نووح)یش بێباوەڕییانکرد ﴿فكذبوا عبدنا وقالوا مجنون وازدجر﴾ جا بەندەی ئێمەیان (نووح) بەدرۆزنزانی و بڕوایان پێنەهێناو وتیان: دێوانەوشێتە، وە لە گەیاندنی پەیامەکەی خوا ڕێگری کرا، ئەم ئایەتەش هەر ئەومانایە دەدا کەدەفەرموێ:: (لئن لم تنته یانوح لتكونن من المرجومین) ﴿١٠ فدعا ربه انی مغلوب﴾ ئینجا نووح - دوای (٩٥٠)ساڵ- داوای لەپەروەردگاری خۆیکرد و وتی: خوایە! بێگومان من شکستم خورادووە ﴿فانتصر﴾ دەسا تۆڵەیان لێبسێنە وسەرمخە، ئەم داوایەش پاش مەیووس بوون بوو لێیان وبەفەرمانی خواشبوو ﴿١١ ففتحنا أبواب السماء بماء منهمر﴾ ئینجا ئێمەیش دەرگاکانی ئاسمانمان بە بارانێکی بەخوڕمکردنەوە ﴿١٢ وفجرنا الأرض عیونا﴾ زەویشمان بەئاوی کانیاوەکان تەقاندەوەو هاتە هەڵقوڵان، تەنانەت لە تەنوورەکانیشیانەوە ﴿فالتقى الماء على امر قد قُدر﴾ ئیترئاوەکە -ئاوی ئاسمان وکانیاوەکان- هەردوو بەیەك گەیشتن لەسەرفەرمانێ لەخواوە بڕیاری درابوو, بەکورتیی: خوای گەورە دەرگاکانی ئاسمانی بەلێزمە لێکردنەوەو لەنێو زەویشەوە لەهەموو لایەکەوە ئاوهەڵقوڵیی وهەردوو ئاوەکە گەیشتنە یەك وتۆفان دەستی پێکردو ئەوانیش لەناوچوون ﴿١٣ وحملناه على ذات الواح ودُسر﴾ و نوحیشمان لەسەرچەند تەختە و بزمارێك - کەشتییەکی‌سادە- هەڵگرت ﴿١٤ تجرى بأعیننا﴾ بەچاودێری ئێمە دەچووو نەمانهێشت نقوم ببێ ﴿جزاء لمن كان كفر﴾ لەناو ئاودا نقومکران لەبەر کوفرو بێباوەڕییان بەنووح ﴿١٥ ولقد تركناها آیة﴾ بێگومان ئێمە ڕووداوی گەمییەکەمان هێشتەوە بە نیشانە بەڵگە بۆ خەڵکانی پەندی لێوەرگرن ﴿فهل من مدكر﴾ جائایا پەند گرێك هەیە پەندی لێوەربگری

الجزء السابع والعشرون — سورة القمر

خُشَّعًا أَبْصَٰرُهُمْ يَخْرُجُونَ مِنَ ٱلْأَجْدَاثِ كَأَنَّهُمْ جَرَادٌ مُّنتَشِرٌ (٧)
مُّهْطِعِينَ إِلَى ٱلدَّاعِ يَقُولُ ٱلْكَٰفِرُونَ هَٰذَا يَوْمٌ عَسِرٌ (٨) كَذَّبَتْ
قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ فَكَذَّبُوا۟ عَبْدَنَا وَقَالُوا۟ مَجْنُونٌ وَٱزْدُجِرَ (٩) فَدَعَا
رَبَّهُۥٓ أَنِّى مَغْلُوبٌ فَٱنتَصِرْ (١٠) فَفَتَحْنَآ أَبْوَٰبَ ٱلسَّمَآءِ بِمَآءٍ مُّنْهَمِرٍ
(١١) وَفَجَّرْنَا ٱلْأَرْضَ عُيُونًا فَٱلْتَقَى ٱلْمَآءُ عَلَىٰٓ أَمْرٍ قَدْ قُدِرَ (١٢)
وَحَمَلْنَٰهُ عَلَىٰ ذَاتِ أَلْوَٰحٍ وَدُسُرٍ (١٣) تَجْرِى بِأَعْيُنِنَا جَزَآءً لِّمَن كَانَ
كُفِرَ (١٤) وَلَقَد تَّرَكْنَٰهَآ ءَايَةً فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ (١٥) فَكَيْفَ كَانَ
عَذَابِى وَنُذُرِ (١٦) وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ
(١٧) كَذَّبَتْ عَادٌ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِى وَنُذُرِ (١٨) إِنَّآ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ
رِيحًا صَرْصَرًا فِى يَوْمِ نَحْسٍ مُّسْتَمِرٍّ (١٩) تَنزِعُ ٱلنَّاسَ كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ
نَخْلٍ مُّنقَعِرٍ (٢٠) فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِى وَنُذُرِ (٢١) وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ
لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ (٢٢) كَذَّبَتْ ثَمُودُ بِٱلنُّذُرِ (٢٣) فَقَالُوٓا۟ أَبَشَرًا
مِّنَّا وَٰحِدًا نَّتَّبِعُهُۥٓ إِنَّآ إِذًا لَّفِى ضَلَٰلٍ وَسُعُرٍ (٢٤) أَءُلْقِىَ ٱلذِّكْرُ عَلَيْهِ
مِنۢ بَيْنِنَا بَلْ هُوَ كَذَّابٌ أَشِرٌ (٢٥) سَيَعْلَمُونَ غَدًا مَّنِ ٱلْكَذَّابُ
ٱلْأَشِرُ (٢٦) إِنَّا مُرْسِلُوا۟ ٱلنَّاقَةِ فِتْنَةً لَّهُمْ فَٱرْتَقِبْهُمْ وَٱصْطَبِرْ (٢٧)

٥٢٩

وبەڕێگەی ئەوهۆزەدا نەچی٘؟! ﴿١٦ فكيف كان عذابى و نذر﴾ جا سزاو ترساندنی من چۆن بوو بۆیان؟! واتە: کە
تۆڵە بسێنم ئاوا ئەیسێنم، دەئێوەش هۆشیاربن ﴿١٧ ولقد يسرنا القرآن للذكر﴾ سوێند بەخوا بێگومان ئێمە
قورئانمان ئاسانکردووە بۆ ئامۆژگاریی وپەندگرتن ﴿لمن كان كفر﴾ بۆ کەسێك باوەڕی پێنەکرا ﴿فهل من مدكر﴾
جائایا ئامۆژگاریگرو پەند وەرگرێ هەیە ئامۆژگاری و پەند وەرگرێت؟.

**سەرگروشتەکەی هۆزی عاد:**

﴿١٨ كذبت عاد فكيف كان عذابى ونذر﴾ هۆزی عادیش پەیامبەرەکەی خۆیان (هود) بەدرۆ خستەوە، ئینجا
سەیرکەن بزانن سزاو تۆڵەی من چۆن بوو؟!﴿١٩ إنا أرسلنا عليهم ريحا صرصرا فى يوم نحس مستمر﴾ بەڕاستی
ئێمە بایەکی ساردی توندی بە لوورەمان نارده سەریان لە ڕۆژێکی شوومی بەردەوامدا، لە سوورەتی: الحاقة / ٧ دا
دەفەرموێ: (سخرها عليه سبع ليال و ثمانية أيام حسوما) ﴿٢٠ تنزع الناس﴾ خەڵکیی لەزەویی هەڵئەگرت و
بەسەرا دەیدان بەداروبەردا ﴿كأنهم أعجاز نخل منقعر﴾ وا لێکردبوون دەتوت بنەداری خورمای هەڵکێشراون ﴿٢١
فكيف كان عذابى ونذر﴾ جائایا سزاو تۆڵەی من چۆنبوو؟! ئایا پشت شکێن نەبوو؟ ﴿٢٢ ولقد يسرنا القرآن للذكر﴾
بەڕاستیی ئێمە ئەم قورئانەمان بۆ پەندوئامۆژگاریی لێوەرگرتن ئاسانکرد ﴿فهل من مدكر﴾ جا ئایا کەسێك هەیە
پەندو ئامۆژگاری وەرگرێ؟

**بەسەرهاتی هۆزی سەموود:**

﴿٢٣ كذبت ثمود بالنذر﴾ گەلی (سەموود)یش ترسێنەری خۆیان (صالح پێغەمبەر) بەدرۆزن داناو، باوەڕیان
پێنەکرد! ﴿٢٤ فقالوا أبشرا منا واحدا نتبعه﴾ ئینجا وتیان: ئایا لەکەسێك پەیڕەوی بکەین، لەناو ئەوهەموو
خەڵکەدا، کە بەلای ئەوانەوە نەلە پیاوماقوڵانەو، نەسەروەتمەند؟ ﴿إنا إذا لفى ضلال وسعر﴾ ئەگەر شوێنی
کەسێکی ئاوا بکەوین! کەوابوو ئێمە لەناوهەڵەو شێتیداین؟! ﴿٢٥ ألقى الذكر عليه من بيننا﴾ ئایا لە نێوانماندا
وەحیی بۆئەو کراوە؟ لەکاتێکا لەو شایستەترمان هەیە ﴿بل هو كذاب أشر﴾ هەرگیز ئەو لەئێمە شیاوتر نیە، بەڵکو
ئەو(صالح) پیاوێکی درۆزن و بەفیزە! ئەیەوێ بەو درۆیانەوەی خۆیە ببێ بەگەورەو سەرۆکمان ﴿٢٦ سيعلمون غدا
من الكذاب الأشر﴾ خوا دەفەرموێ: سبەینێ ئەزانن و بۆیان دەردەکەوێت کە: درۆزنی بەفیز کێیە، صالح، یان
ئەوان؟ ﴿٢٧ إنا مرسلوا الناقة فتنة لهم﴾ دووبارە خوا فەرمووی: بێگومان ئێمە ئەو وشترە مێیە لەبەردێکی ڕەق
وتەق و ساف و لووس، لەسەر داوای خۆیان بەدەردێنین ﴿فارتقبهم واصطبر﴾ جا تۆش چاوەڕوانیان بکەو بەئارام و
خۆگربە لەسەر ئەزیەت و ئازاریان تا فەرمانی خوا دێت ﴿٢٨ ونبئهم أن الماء قسمة بينهم﴾ وە هەواڵیان پێبدە کە
ئەوئاوە بەشکراوە لەنێوانیاندا، ڕۆژێ بۆئەوان و، ڕۆژێکیش بۆ وشترەکە، وەك ئەفەرموێ: (هذه ناقة لها شرب ولكم
شرب يوم معلوم) (١٥٥/٢٦) ﴿كل شرب محتضر﴾ هەمووکەسێ لەسەرەبەشی خۆیدا ئامادە دەبێت، واتە: نابێ هیچ
لایەك بڕواتە سەر بەشی ئەولاکەی تر ﴿٢٩ فنادوا صاحبهم﴾ ئینجا ئەوانە لەباتی گوێرایەڵیی، بانگی هاوڕێکەیان
کرد کە پیاوێکی کەللە شەق بوو، ئینجا هەڵیان نا بۆ کوشتنی وشترەکە ﴿فتعاطى فعقر﴾ جا ئەویش بەگوێی کردن
و بێباکانە ڕۆیشت و شمشێرێکی لێهەڵگرت و قاچی پەڕاندو کوشتیی! ﴿٣٠ فكيف كان عذابى ونذر﴾ جا سزاو تۆڵەی
من چۆن بوو؟ ﴿٣١ إنا أرسلنا عليهم صيحة واحدة﴾ بەڕاستیی ئێمەیش تەنیا نەعرەتەو دەنگێکی سامناکمان نارده
سەریان ,جوبریل هات و قیراندی بەسەریاندا ﴿فكانوا كهشيم المحتظر﴾ جا هەموو وەك پووشی وردبووی خاوەنی

حەظیرەیان لێهات کەکۆی دەکاتەوە بۆمەڕەکانی لەزستاندا ﴿ ٣٢ ولقد یسرنا القرآن للذکر﴾ بێگومان ئێمە قورئانمان ئاسانکرد بۆ پەندو ئامۆژگاری لێوەرگرتن ﴿فهل من مدکر﴾ جائایا پەند وەگرێ هەیە؟!.

**چیرۆکی هۆزی لووط:**

﴿ ٣٣ کذبت قوم لوط بالنذر﴾ گەلی (لووط)یش بڕوایان نەکرد بە ترساندنەکانی پێغەمبەرەکەیان (لووط) – سەلامی لەسەربێ– لە سزای خوا لەسەرکارەدزێوەکەیان ﴿ ٣٤ إنا ارسلنا علیهم حاصبا﴾ بەراستی ئێمەش با یەکی توندمان ناردە سەریان و وردە زیخی تێدەگرتن ﴿إلا آل لوط﴾ بەلاّم ئالی لووط: خۆی و دووکچەکەی کەبڕوایان هێنابوو ﴿نجیناهم بسحر﴾ لە بەرەبەیانێکی زوودا ڕزگارمان کردن لەوسزایەی بۆئەوان هات ﴿ ٣٥ نعمة من عندنا﴾ ئەو رزگارکردنە نیعمەت وچاکەیەك بوو لەلایەن ئێمەوە ﴿کذلك نجزی من شکر﴾ ئاوا هەر کەسێك سوپاسگوزاری من بکات و بڕوا بێنێ، ئەوا ئێمەیش هەر ئاوا پاداشتی ئەدەینەوە ﴿ ٣٦ ولقد انذرهم بطشتنا﴾ بێگومان پێشتر لەهەڵمەتی توندی ئێمە لووط ئاگاداری کردبوون ﴿فتماروا بالنذر﴾ کەچی گومانیان هەبوو لەترساندنەکان ﴿ ٣٧ ولقد راودوه عن ضیفه﴾ بێگومان داوای میوانەکانیان لێکرد بەمەستی نێربازیی وکاری دزێو! ﴿فطمسنا اعینهم﴾ ئێمەیش کوێرییمان داهێنان، ئەوەبوو بەناویەکتردا ئەهاتن وئەچوون میوانەکانیان نەدەبینی ﴿فذوقوا عذابی ونذر﴾ دەسابچێژن سزاوتۆڵەی من ﴿ ٣٨ ولقد صبحهم بکرة عذاب مستقر﴾ بێگومان لەبەرەبەیانێکی زوودا سزایەکی توندو هەمیشەیی دەرگای پێگرتن، جوبریل شارەکەیانی لەبن هێناو بەرزی کردەوەو کوتای بەسەریانداو، بەفەرمانی خوا بەردەبارانی کردن و هەموو تیاچوون ﴿ ٣٩ فذوقوا عذابی ونذر﴾ دەسابچێژن سزاو تۆڵەی من ﴿ ٤٠ ولقد یسرنا القرآن للذکر﴾ بێگومان ئێمە قورئانمان ئاسانکرد بۆ پەندو ئامۆژگاری ﴿فهل من مدکر﴾ جا ئایا پەند گرێ هەیە؟ تا داچڵەکێ وئامۆژگاری وەربگرێ؟ بەڵێ.. لەپاش هەرچوار داستانەکەوە ئەم رستەی (ولقد یسرنا القرآن للذکر فهل من مدکر) وتراوەتەوە، بۆئەوە زیاتروزیاتر پەندیان لێوەربگیرێ و مرۆڤەکان جاردوایجار هۆشیار ببنەوە.

الجزء السابع والعشرون — سورة القمر

وَنَبِّئۡهُمۡ أَنَّ ٱلۡمَآءَ قِسۡمَةُۢ بَيۡنَهُمۡۖ كُلُّ شِرۡبٖ مُّحۡتَضَرٞ ﴿٢٨﴾ فَنَادَوۡاْ صَاحِبَهُمۡ فَتَعَاطَىٰ فَعَقَرَ ﴿٢٩﴾ فَكَيۡفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ ﴿٣٠﴾ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ صَيۡحَةٗ وَٰحِدَةٗ فَكَانُواْ كَهَشِيمِ ٱلۡمُحۡتَظِرِ ﴿٣١﴾ وَلَقَدۡ يَسَّرۡنَا ٱلۡقُرۡءَانَ لِلذِّكۡرِ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ ﴿٣٢﴾ كَذَّبَتۡ قَوۡمُ لُوطِۢ بِٱلنُّذُرِ ﴿٣٣﴾ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ حَاصِبًا إِلَّآ ءَالَ لُوطٖۖ نَّجَّيۡنَٰهُم بِسَحَرٖ ﴿٣٤﴾ نِّعۡمَةٗ مِّنۡ عِندِنَاۚ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي مَن شَكَرَ ﴿٣٥﴾ وَلَقَدۡ أَنذَرَهُم بَطۡشَتَنَا فَتَمَارَوۡاْ بِٱلنُّذُرِ ﴿٣٦﴾ وَلَقَدۡ رَٰوَدُوهُ عَن ضَيۡفِهِۦ فَطَمَسۡنَآ أَعۡيُنَهُمۡ فَذُوقُواْ عَذَابِي وَنُذُرِ ﴿٣٧﴾ وَلَقَدۡ صَبَّحَهُم بُكۡرَةً عَذَابٞ مُّسۡتَقِرّٞ ﴿٣٨﴾ فَذُوقُواْ عَذَابِي وَنُذُرِ ﴿٣٩﴾ وَلَقَدۡ يَسَّرۡنَا ٱلۡقُرۡءَانَ لِلذِّكۡرِ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ ﴿٤٠﴾ وَلَقَدۡ جَآءَ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ ٱلنُّذُرُ ﴿٤١﴾ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا كُلِّهَا فَأَخَذۡنَٰهُمۡ أَخۡذَ عَزِيزٖ مُّقۡتَدِرٍ ﴿٤٢﴾ أَكُفَّارُكُمۡ خَيۡرٞ مِّنۡ أُوْلَٰٓئِكُمۡ أَمۡ لَكُم بَرَآءَةٞ فِي ٱلزُّبُرِ ﴿٤٣﴾ أَمۡ يَقُولُونَ نَحۡنُ جَمِيعٞ مُّنتَصِرٞ ﴿٤٤﴾ سَيُهۡزَمُ ٱلۡجَمۡعُ وَيُوَلُّونَ ٱلدُّبُرَ ﴿٤٥﴾ بَلِ ٱلسَّاعَةُ مَوۡعِدُهُمۡ وَٱلسَّاعَةُ أَدۡهَىٰ وَأَمَرُّ ﴿٤٦﴾ إِنَّ ٱلۡمُجۡرِمِينَ فِي ضَلَٰلٖ وَسُعُرٖ ﴿٤٧﴾ يَوۡمَ يُسۡحَبُونَ فِي ٱلنَّارِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمۡ ذُوقُواْ مَسَّ سَقَرَ ﴿٤٨﴾ إِنَّا كُلَّ شَيۡءٍ خَلَقۡنَٰهُ بِقَدَرٖ ﴿٤٩﴾

وَمَآ أَمۡرُنَآ ٥٣٠

**بەسەرهاتی فیرعەون و دەستەو بەستەکەی:**

﴿ ٤١ ولقد جاء آل فرعون النذر﴾ سوێند دەخۆم بێگومان ترسێنەرەکانمان (مووساو هاروون) هاتنە لای ئالی فیرعەون، بەڵکو لەخراپەکاری بسڵەمێنەوە ﴿ ٤٢ کذبوا بآیاتنا کلها﴾ کەچی لەباتی بڕواهێنان تەواوی موعجیزەکانی ئێمەیان بەدرۆداناو بڕوایان پێ نەکردن! ﴿فأخذناهم اخذ عزیز مقتدر﴾ ئەوسا ئێمەیش گرتمانن بەگرتنی خاوەن هێزێکی بەتوانای تێنەشکاو ﴿ ٤٣ اکفارکم خیر من اولئکم﴾ ئایا بێبڕواکانی ئێوە ئەی عەرەبەکان! باشترن

لەبێبڕواکانی گەلی نووح و، عادو، سەموود؟ تاهیوای رزگاربوونیان ببێ؟! نەخێر، کەوابوو ئێوەیش هەر چاوەڕوانی ئەوڕۆژەبن ﴿أم لكم براءة فى الزبر﴾ یاخۆ بەرائەتتان بۆهەیە لە سزا لەکتێبە ئاسمانییەکاندا ، واتە:پسوڵەی رزگاربوونتان بۆهاتووە کەتووشی ئەو بەلایانە نابن؟ ﴿[٤٤] أم يقولون نحن جميع منتصر﴾ یاخێر ئەڵێن: هەمووکۆمەڵێکی یەکگرتووی سەرکەوتووین لەبەر زۆری وبە هێزیمان هەرگیز ناشکێین؟ ﴿[٤٥] سيهزم الجمع ع ويولون الدبر﴾ لەمە پاش ئەو کۆمەڵە تێدەشکێنرێ و پاشەو پاش هەڵدێن ورادەکەن بۆدواوە.بەڵێ هەرواش دەرچوو چونکە لەرۆژی بەدردا هەمووتێکشکان و هەڵهاتن. (ئیبن عەباس) ئەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەرۆژی بەدردا چادرێکی بۆ هەڵدرابوو لەناوچادرەکەدا بەردەوام ئەیفەرموو: ((انشدك عهدك ووعدك اللهم إن شئت لم تعبد بعد اليوم فى الأرض ابدا)) جا ئەبوبەکر (خوا لێی رازی بێت) وتی: بەسە ئەی پێغەمبەر! ئەوەندە داوات لەخواکرد، پاشان لەنێو جل وبەرگی جەنگیدا هاتەدەرێ وئەیفەرموو: ((سيهزم الجمع ويولون الدبر، بل الساعة موعدهم، والساعة أدهى وأمر)). فتح البارى: ٤٥٨/٨ و ٤٨٦. ﴿[٤٦] بل الساعة موعدهم﴾ بەڵکو جگە لەوە رۆژی قیامەت کاتی بەڵێنیانە ﴿والساعة ادهى وأمر﴾ خۆ ئەوساتەش ناهەموارترو تاڵترە لە سزای دنیا، واتە: کوشتن ودیلبوون زۆرئاسانترە لەچاوسزای رۆژی دوایی کەچاوەروانیانە.

## کۆتا رۆژی تاوانباران:

﴿[٤٧] إن المجرمين فى ضلال وسعر﴾ بێگومان تاوانکارەکان لەسەرگەردانییەکیدوور لە هەق و لە ئاگرێکی هەڵگیرساودان ﴿[٤٨] يوم يسحبون فى النار على وجوههم﴾ ئەو رۆژە کەلەسەر روویان بەناوئاگردا رائەکێشرێن ﴿ذوقوا مس سقر﴾ پێیان ئەوترێ: دەبچێژن گەرماو سزای دۆزەخ , لەپاداشتی کارەکانتاندا، دەبزانم کەسێك هەیە قوتارتان بکات ﴿[٤٩] إنا كل شئ خلقنا بقدر﴾ بەراستیی ئێمە هەمووشتێکمان بەئەندازەیەکی دیاریکراو درووستکردووە ﴿[٥٠] وما أمرنا إلا واحدة كلمح بالبصر﴾ خۆفەرمانی ئێمەش - بۆ بەدیهێنانیشتێك بمانەوێ ببێت ،هەر یەك وشەیە،ئەویش وەك چاو هەڵهێنانێکە لە خێراییدا.(مەبەست بەو وشەیەش لێرەدا, وشەی((كن))ـە. ﴿[٥١] ولقد أهلكنا أشياعكم﴾ سوێندبێ بەخوا کە بێگومان هاوشێوەکانتانمان ئەی قورەیش! لە کوفرو بێباوەڕیدا لەناو برد ﴿فهل من مدكر﴾ ئاخۆ لەوهەموو رووداوانەدا کەسێکی ژیروپەندوەرگرهەیە؟ ﴿[٥٢] وكل شئ فعلوه فى الزبر﴾ وەهەرشتێکیان کردبێ - لەخێرو لەشەڕ- لە نامەکانی فریشتەکاندا تۆمارکراوە ﴿[٥٣] وكل صغير وكبير مستطر﴾ وەهەر بچووکێك وگەورەیەك لە ئەعمالی خەڵك نووسراوە بەدێڕو, بۆشیان دێنینە ڕوو، ئیمامی (ئەحمەد):١٥١/٦. لە خاتوو (عائیشە)ەوە هێناویەتی: ((أن رسول الله ﷺ قال: يا عائشة! إياك ومحقرات الذنوب، فإن لها من الله طالبا)) واتە:پێغەمبەر ﷺ بەخاتوو عائیشەی فەرموو: خۆت لەگوناحە بچوك و بەهیچ دانەنراوەکان دوور بگرە! بەڕاستی بەلای خواوە داواکاریان هەیە.

## پاداشتی پارێزکاران:

﴿[٥٤] إن المتقين فى جنات ونهر﴾ بەراستی ئەوانەش خۆیان لە شیرك وقەدەغەکراوەکانی خوا پاراستووە لەناو چەندان بەهەشت ورووباری فرەجۆرن: رووباری ئاو، رووباری عارەق، رووباری هەنگوین، رووباری شیر ﴿[٥٥] فى مقعد صدق﴾ لە جێگایەکیخۆش وپەسەندان ﴿عند مليك مقتدر﴾ لەلای خوای پاشای بەدەسەلات، لەوێ شادمان وخۆشنوودن، ئیمامی(ئەحمەد) لە(عەبدوڵلای کوڕی عەمر)ـەوە دەڵێ: ((المقسطون عند الله على منابر من نور عن يمين الرحمن وكلتا يديه يمين، الذين يعدلون فى حكمهم وأهليهم وما ولوا)) اخرجه مسلم: ١٤٨٥/٣. أحمد: ١٦٠/٢.

النسائی: ٨/٢٢١. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دادگەرەکان لەلای دەستی راستی خوای بەبەزەیین – خۆ هەردوو دەستیشی ڕاستن– لەسەرچەند میمبەرێکی نوورانین، ئەوانەش ئەوکەسانەن لەنێوخانەوادەی خۆیاندا و، لەگەڵ ئەوانەدا لەژێر دەسەڵاتی ئەواندان بەدادگەرانە بڕیارو فەرمان ئەدەن. سا خوا بەمیهرەبانی خۆت بمانخەیتە ناو ئەوانەوە.

لەشەوی (١٥/١٤) شەعبانی (١٤١٧)ك بەرامبەر بە (١٩٩٦/١٢/٢٥/٢٤)ز، کاتژمێر (٩:٥)ی شەو، لە شاری (مەریوان) لە تەفسیری ئەم سوورەتە بوومەوە.

*** *** ***

الجزء السابع والعشرون | سورة الرحمن

وَمَا أَمْرُنَا إِلَّا وَاحِدَةٌ كَلَمْحٍ بِالْبَصَرِ ﴿٥٠﴾ وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا
أَشْيَاعَكُمْ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿٥١﴾ وَكُلُّ شَيْءٍ فَعَلُوهُ
فِي الزُّبُرِ ﴿٥٢﴾ وَكُلُّ صَغِيرٍ وَكَبِيرٍ مُّسْتَطَرٌ ﴿٥٣﴾ إِنَّ الْمُتَّقِينَ
فِي جَنَّاتٍ وَنَهَرٍ ﴿٥٤﴾ فِي مَقْعَدِ صِدْقٍ عِندَ مَلِيكٍ مُّقْتَدِرٍ ﴿٥٥﴾

ترتيبها ٥٥ — سُورَةُ الرَّحْمَٰنِ — آياتها ٧٨

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

الحزب ٥٤ الرَّحْمَٰنُ ﴿١﴾ عَلَّمَ الْقُرْآنَ ﴿٢﴾ خَلَقَ الْإِنسَانَ ﴿٣﴾
عَلَّمَهُ الْبَيَانَ ﴿٤﴾ الشَّمْسُ وَالْقَمَرُ بِحُسْبَانٍ ﴿٥﴾ وَالنَّجْمُ
وَالشَّجَرُ يَسْجُدَانِ ﴿٦﴾ وَالسَّمَاءَ رَفَعَهَا وَوَضَعَ الْمِيزَانَ
﴿٧﴾ أَلَّا تَطْغَوْا فِي الْمِيزَانِ ﴿٨﴾ وَأَقِيمُوا الْوَزْنَ بِالْقِسْطِ
وَلَا تُخْسِرُوا الْمِيزَانَ ﴿٩﴾ وَالْأَرْضَ وَضَعَهَا لِلْأَنَامِ ﴿١٠﴾
فِيهَا فَاكِهَةٌ وَالنَّخْلُ ذَاتُ الْأَكْمَامِ ﴿١١﴾ وَالْحَبُّ ذُو الْعَصْفِ
وَالرَّيْحَانُ ﴿١٢﴾ فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿١٣﴾ خَلَقَ
الْإِنسَانَ مِن صَلْصَالٍ كَالْفَخَّارِ ﴿١٤﴾ وَخَلَقَ الْجَانَّ
مِن مَّارِجٍ مِّن نَّارٍ ﴿١٥﴾ فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿١٦﴾

٥٣١

## ٥٥- سوورەتی (ڕەحمان)ـە مەککەییەو (٧٨) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتە باسی بیروباوەڕە بناغەییەکان دەکات، ئەڵێن ئەمسوورەتە لەنێوان سوورەتە مەککەییەکانی تردا وەك (عەرووس) و بووك وایە، بۆیە هاتووە: (لکل شئ عروس، وعروس القرآن سورة الرحمن). یەکەم جار باسی نیعمەت و بەهرەکانی خوا دەکات، هەر لەفێرکردنی قورئانەوە هەتادروستکردنی ئادەمزادو،زمان پێبەخشینی و بیروهۆش بۆ لێکدانەوەی مەبەستەکان ویەکتری تێگەیاندن، ئینجا لاپەڕەکانی بوونەوەر یەك لەدوای یەك هەڵئەداتەوە بەدەیان بەهرەی خوا باس دەکات.. پاشان مردن و تیاچوون دێتە پێشەوەو هەموو بوونەوەر دەفەوتێ تەنها پەروەردگار ئەمێنێتەوە:(کل من علیها فان ویبقی وجه ربك ذو الجلال و الإکرام). لەگەڵ هێنانی هەندێ لەقۆناغەکانی قیامەت وحاڵی کافران وتۆڵەیان و پاشان ئەوهەموو نازو نیعمەتە ئامادەکراوانە بۆصاڵحان وچاککاران، کۆتاییشی بەسوپاس وستایشی پەروەردگاردێ، جابەم ئایەتەیش دەرگای دائەخرێ: (تبارك اسم ربك ذی الجلال والإکرام).

### خوا پێغەمبەری فێری قورئان کرد:

﴿بسم الله الرحمن الرحیم * [1] الرحمن * [2] علم القرآن﴾ خوای بە بەزەیی قورئانی فێری موحەممەد ﷺ کرد. ئەم ئایەتە وەڵامە بۆ خەڵکی مەککە کە ئەیانوت:(إنما یعلمه بشر). ﴿[3] خلق الإنسان﴾ ئادەمیی دروستکرد، لەگەڵ ئەوهەموو ژیریی و زیرەکیەیدا ﴿[4] علمه البیان﴾ فێری دەر بڕینی کرد لە ناخی خۆیی و تێگەیاندنی خەڵکی دیکە بە نوتقێکی ئاشکراو نمایان , خوا زمانی دایە بۆئەوەی مەبەستەکانی خۆی بەجوانی بەفەرهەنگ وکەلتوورێك کە خوا پێی بەخشیووە رابگەیەنێت، (مەراغیی) ئەڵێت: ئادەمزاد لەبەرئەوە کە بەسروشت گیانلەبەرێکی خاوەن هەست ونەستەو هۆگرو کۆمەڵایەتییە، جا بۆدەربڕینی مەبەستەکانی خۆی، خوای گەورە زمانی قسەو گفتوگۆی پێ

بەخشیوە، واتە: زمان و فەرهەنگ دوو بەهرەی گرنگی خوان، ئەبێ هەردوو ئازاد بن، چونکە بەڵگەن لەسەر بوون و دەسەڵاتی خوا. .ئاخ من ئەمزانی قاچاغ کردن وياساغ کردنی زمانی هەندێ لەگەلانی بێچارە، لەچییەوە وەرگیراوە؟!

**خۆرو هەیڤ، ئاسمان و زەویی، بەڵگەی خوان:**

پاشان لە زەوییەوە چاوێکیان پێ هەڵئەبڕێ بۆلای سەروو ئەفەرموێ: ﴿٥ الشمس والقمر بحسبان﴾ خۆرومانگ – کە دووکورەی زۆربەنرخن– بەحیسابێکی ورد دێن ودەچن. ئینجا دووبەهرەی زەوییان بۆ باس دەکات، بۆیە ئەفەرمووێ: ﴿٦ والنجم والشجر يسجدان﴾ وەئەستێرەو درخت سوژدە دەبن بۆ خوا, واتە:گژوگیای بێساق وساقدار– بەئارەزووی خۆیان– ملکەچیی خۆیان دەرئەبڕن وسوژدە دەبەن بۆخوا "ئاشکرایشە کەئەگەر گیاو رووەك نەبێت، باری ئابووری وڵاتمان زۆردێتە خوارێ ﴿٧ والسماء رفعها ووضع الميزان﴾ وئاسمانیشی بەرزو بڵوند کردەوە، بینایەکی قاییم ومەحکەمی بۆ ڕاگرتووە، و تەرازووی دادی بۆهەمووشتێك دانا ﴿٨ الا تطغوا فی الميزان﴾ بۆ ئەوەی لەکێشانەکردندا ستەم نەکەن ﴿٩ واقيموا الوزن بالقسط﴾ وەبەرێك وپێکیو دادگەری کێشانە بکەن ﴿ولا تخسروا الميزان﴾ وەکەم مەکەن لەکێشانەدا ﴿١٠ والأرض وضعها للأنام﴾ و زەویشیداناوە بۆ هەموو دروستکراوەکان ،تاهەموو خاوەن گیانێکی تیابژی , بەڵێ خوای گەورە ئەم کورەی زەویەی داناوە بۆ تەواوی گەلانی جیهان بێجیاوازیی لەنێوان هیچ جۆرە زمان و کالاَو بالاَیەکدا، وەبێ ئەوە کەهیچ گەلێك شایستەتر بێ بەژیان لەسەری، بەڵام زۆر بەداخەوە لەسەدەی بیستەمیشدا هێمان چەندین گەل بێجێ و نیشتمان ئەسوڕێنەوە! هەر ناشوێرێ باسی نیشتمانی خۆیبکات، وەك ئەوە لەم جیهانەدا مافی ژیانی نەبێ! ئومێدەوارم ئەم ئایەتە پێش چاوبگیرێ و، هەموو قەوم و هۆزو گەلێك نیشتمانی خۆی بدرێتێ. ﴿١١ فيها فاكهة والنخل ذات الأكمام﴾ هەمە جۆر میوەو دارخورمای پورگداری تێدایە ﴿١٢ والحب ذو العصف والريحان﴾ وچەندان جۆر دانەوێڵەی تۆێکڵدارو گوڵ و گژوگیای بۆنخۆشی تێدایە.

**لەکام چاکەی پەروەردگار حاشا دەکەن؟:**

﴿١٣ فبأى آلاء ربكما تكذبان﴾ جا ئیتر بەکام نیعمەت لە نیعمەتەکانی پەروەردگارتان (ئەی گرۆی ئادەمیی وجنیی!) ناشوکری دەکەن؟ حەقتانە کەسەیری ئەو هەموو بەهرانە دەکەن بڕوابێنن و خۆتان یەکلابکەنەوە بۆی، (عەبدوڵلای کوڕی عومەر) ئەڵێت: پەیامبەر ﷺ جارێك سوورەتی (ڕەحمان)ی بەسەر هاوەڵانیدا خوێندەوەو بێدەنگ بوون! ئەویش فەرمووی: بۆچی وەڵام نادەنەوە؟ بۆچی هەرکات بموتایە: (فبأى آلاء ربكما تكذبان) جنیەکان ئەیانوت: ((لا بشئ من نعمك ربنا نكذب فلك الحمد)). تیرمزیی هێناویەتی و (حاکم)یش بەڕەواو دروستی داناوە.

تێبینی: ڕستەی (فبأى آلاء ربكما تكذبان) لەم سوورەتەدا (٣١) جار دووپاتکراوەتەوە.

**مرۆ لە قوڕی وشکەوە بوو چەشنی سواڵە وەدیهات:**

﴿١٤ خلق الإنسان من صلصال كالفخار﴾ ئادەمی باوکی ئادەمزادی لەقوڕێکی وشکەوە بووی وەك سواڵەت، دورستکرد. ڕاڤەکەرانی قورئان ئەڵێن: خوایزانا دەربارەی دروستکردنی ئادەم لەم سوورەتەدا ئەفەرموێ: (من صلصال كالفخار) لەسورەتی (حجر)دا (من صلصال من حمأ مسنون) لە قوڕێکی ڕەشی گۆڕاو، لە (صافات)دا لەقوڕێکی لینج، لە (آل عمران)دا (كمثل آدم خلقه من تراب) لەگڵ، هیچ دژایەتییەك لەنێوان ئەوحاڵەتانەدا نییە، چونکە لەبنەڕەتدا گڵەکەی لەزەوی وەرگرتووە، پاشان بەئاو شێلراوەو بووەتە جۆرە قوڕێك کەدەست بگرێ، پاشان

دانراوه تاترشاوەو ڕەش وەرگەڕاوە، ئینجا وێنەو نەخشەی کێشاوە وەك پەیکەر، دواتر وشك کراوەتەوە تاوەك سواڵەتی لێهاتووە، دواییش گیانی بەبەردا کردووە.

**جنۆکەی لە بڵێسەی بێ دووکەڵی ئاگر دروستکرد:**

﴿[١٥] وخلق الجان من مارج من نار﴾ وە ئەسڵی پەریشی(جان) کە باوکی نەوعی جنۆکەیە، لەئاگرێکی گڕدارو پاك وپوختەو بێدووکەڵ دروستکرد، پاشان پلەبەپلە گەیاندیە ئەوجێگایە کەشیاوی کارەکەی خۆی بێ، لەفەرموودەیەکدا هاتووە، ((خلقت الملائكة من نور وخلق الجان من مارج من نار، وخلق آدم مما وصف لكم))موسلیم: ٢٢٩٤/٤. احمد: ١٦٨/٦. واتە: فریشتە لە (نوور)و، (جان) لە ئاگر دروستکران، ئادەمیش لەوەی وەسفتان بۆ کراوە لە قورئاندا،واتە: لەگەڵ. ﴿[١٦] فبأى آلاء ربكما تكذبان﴾ جا ئیتر بەکام نیعمەت لە نیعمەتەکانی پەروەردگارتان ناشوکری دەکەن؟ ﴿[١٧] رب المشرقين ورب المغربين﴾ هەرئەوخوایە خاوەنی دوو هەڵاتگەی خۆرە لەهاوێن و زوستاندا، وەخاوەنی دوو جێگای خۆرئاوا بوونی خۆرە لە هاوین و زوستاندا، وەك دەفەرموێ: (فلا أقسم برب المشارق و المغارب) (٤٠/٧٠). یان دەفەرموێ: (رب المشرق والمغرب لا إله إلا هو فاتخذه وكيلا) (٩/٧٣). ﴿[١٨] فبأى آلاء ربكما تكذبان﴾ جا بەکام نیعمەت لە نیعمەتەکانی پەروەردگارتان ناشوکری دەکەن؟. ﴿[١٩] مرج البحرين يلتقيان﴾ دوودەریای یەکێ شیرین و یەکێ سوێر لەپاڵ یەکتردا بەردانەوە پێك دەگەن ﴿[٢٠] بينهما برزخ لا يبغيان﴾ لەنێوانیاندا بەربەستێك هەیە، بە هۆی ئەوەوە تێکەڵنابن بەیەکتر، هەتادەریا سوێرەکە سیفەتی شیرینی ئەولاببات ،یان دەریاشیرینەکە سیفەتی سوێری ئەو نەهێڵێ.. پەروەردگار ناهێڵێ هیچیان لەکیس بچن!! ﴿[٢١] فبأى آلاء ربكما تكذبان﴾ جا کام نیعمەت لە نیعمەتەکانی پەروەردگارتان ناشوکری دەکەن؟ ﴿[٢٢] يخرج منهما اللؤلؤ والمرجان﴾ لەو دوو دەریایە مرواریی وشیلان دەردەچێت.

الجزء السابع والعشرون — سُورَةُ الرَّحمٰن

رَبُّ ٱلْمَشْرِقَيْنِ وَرَبُّ ٱلْمَغْرِبَيْنِ ﴿١٧﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿١٨﴾
مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ ﴿١٩﴾ بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَّا يَبْغِيَانِ ﴿٢٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ
رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢١﴾ يَخْرُجُ مِنْهُمَا ٱللُّؤْلُؤُ وَٱلْمَرْجَانُ ﴿٢٢﴾ فَبِأَيِّ
ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢٣﴾ وَلَهُ ٱلْجَوَارِ ٱلْمُنشَـَٔاتُ فِى ٱلْبَحْرِ كَٱلْأَعْلَـٰمِ
﴿٢٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢٥﴾ كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ﴿٢٦﴾ وَيَبْقَىٰ
وَجْهُ رَبِّكَ ذُو ٱلْجَلَـٰلِ وَٱلْإِكْرَامِ ﴿٢٧﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ
﴿٢٨﴾ يَسْـَٔلُهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِى شَأْنٍ ﴿٢٩﴾ فَبِأَيِّ
ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٠﴾ سَنَفْرُغُ لَكُمْ أَيُّهَ ٱلثَّقَلَانِ ﴿٣١﴾ فَبِأَيِّ
ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٢﴾ يَـٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ إِنِ ٱسْتَطَعْتُمْ
أَن تَنفُذُوا۟ مِنْ أَقْطَارِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ فَٱنفُذُوا۟ ۚ لَا تَنفُذُونَ
إِلَّا بِسُلْطَـٰنٍ ﴿٣٣﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٤﴾ يُرْسَلُ عَلَيْكُمَا
شُوَاظٌ مِّن نَّارٍ وَنُحَاسٌ فَلَا تَنتَصِرَانِ ﴿٣٥﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا
تُكَذِّبَانِ ﴿٣٦﴾ فَإِذَا ٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ فَكَانَتْ وَرْدَةً كَٱلدِّهَانِ
﴿٣٧﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٨﴾ فَيَوْمَئِذٍ لَّا يُسْـَٔلُ عَن ذَنۢبِهِۦٓ
إِنسٌ وَلَا جَآنٌّ ﴿٣٩﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٠﴾

يُعْرَفُ ٱلْمُجْرِمُونَ ٥٣٢

(سەید قوطب) -خوا لێیخۆش بێت- چەند جوان ئەڵێت: (لؤلؤ): لەبنەڕەتا یەکێکە لە گیانلەبەرە سەمەرەکانی دەریا، ولەناو (صەدەف) ێکدایەو خۆی هەڵئەدات بۆقوڵایی دەریاکان، و لە گەڵ گیانلەبەرەکانی تر، جیاوازییەکی‌زۆری هەیە، چ لەڕووی پێکهاتەی لەش وقەوارەیەوە، چ لەڕووی شێوەی زیندەگی‌و ژیانیەوە، تۆڕێکی پێوەیە وەك تۆڕی ماسیگر، زۆرسەیر تەنراوە، لەوتۆڕەوە ڕۆشنایی وئاووهەواو خۆراك وەرئەگرێ، لەولایشەوە وەك پاڵێوەر (مصفاة) وایە بۆی، ناهێڵێ چەوو لم و زیخ بڕواتە سکیەوە لەژێر تۆڕەکەیشەوە چەند دەمێکی هەیە، هەردەمەی چوار لێوی هەیە، جاهەرکات چەوو لم وزیخ، یان هەرچێ بڕواتە ژوورەوە بەپەلە مادەیەکی لینجی بەسەرا ئەڕژێ و دایئەپۆشێ، پاشان ئەیبەستێت و ئەبێتە مرواری ئیتر گەورەو بچووکیی بەپێی ئەوە ئەبێت.. زنجیە

بەردەمەرجانییەکان لەباکووری خۆهەڵاتی ئوسترالیادا کە درێژییان (١٣٥٠) میل ئەبێ و پانیشیان (٥٠) میل ئەبێ، هەر لەو شتە سەرسوڕهێنەرانەیە. ﴿[٢٣] فبأي آلاء ربكما تكذبان﴾ جا ئەی ئادەمیی وجینی کام نیعمەتی پەروەردگارتان بەدرۆ دەخەنەوە؟! ﴿[٢٤] وله الجوار المنشآت في البحر كالأعلام﴾ وهەمووئەو گەمیانەش- دەڵەی کێون – لە دەریاکاندا هەر بۆ خوان , واتە: خواکەوییکردوون بۆتان بەئاسانیدێن و دەچن و ئێوەش بازرگانییان پێدەکەن ﴿[٢٥] فبأي آلاء ربكما تكذبان﴾ جابە چ نیعمەتێکی پەروەردگارتان بڕوا ناهێنن؟ خۆ ئەگەرخوا بەلوتفی خۆی ئەوکەشتیی وگەمییانە رانەگرێ، ئەوا خۆتان و کەشتییەکانتان نقوم ئەبن.

**بێ لە خوا کەس نامێنێ لەم زەمینە:**

﴿[٢٦] كل من عليها فان﴾ هەرچی بەسەر پشتی زەویەوەیە، هەرهەموو لە نێو دەچێ ﴿[٢٧] ويبقى وجه ربك ذوالجلال والإكرام﴾ و تەنها رووی پەروەرد گاری خاوەن شکۆوکەرەمکەرت دەمێنێتەوە. (مذهب أهل السنة والجماعة أن لله وجهاً حقيقيا يليق به موصوفا بالجلال والإكرام، وقد دل على ثبوته لله تعالى الكتاب والسنة، فمن الكتاب قوله تعالى: (ويبقى وجه ربك ذو الجلال والإكرام) ومن أدلة السنة: قول النبي ﷺ: في الدعاء المأثور:((وأسألك لذة النظر إلا وجهك والشوق إلى لقاءك)) فوجه الله تعالى من صفاته الذاتية الثابتة له حقيقة على الوجه اللائق به. ولا يصح تحريف معناه إلى الثواب لوجوه منها:

أولا: أنه خلاف ظاهر النص وما كان مخالفا لظاهر النص فإنه يحتاج إلى دليل، ولا دليل على ذلك. ثانيا: إن هذا الوجه ورد في النصوص مضافا إلى الله تعالى والمضاف إلى الله: إما أن يكون شيئا قائما بنفسه، وإما أن يكون غير قائم بنفسه، فإن كان قائما بنفسه فهو مخلوق، وليس له صفاته كبيت الله، وناقة الله، وإنما إضيف إليه إما للتشريف وإما من باب إضافة الملوك والمخلوق إلى مالكه وخالقه، وإن كان غير قائم بنفسه فهو من صفات الله، وليس بمخلوق كعلم الله، وقدرته، وعزته، وكلامه، ويده، وعينه ونحوذلك، والوجه بلا ريب من هذا النوع، فإضافته إلى الله من باب إضافة الصفة إلى الموصوف.

ثالثا: أن الثواب مخلوق بائن عن الله، والوجه صفة من صفات الله غيرمخلوق ولا بائن، فكيف يفسر هذا بهذا؟

رابعا: إن ذلك الوجه وصف في النصوص بالجلال والإكرام، بأن له نورا يستعاذ به، وسبحات تحرق ما انتهى إليه بصر الله من خلقه، وكل هذه الأوصاف تمنع أن يكون المراد به الثواب والله أعلم. (تلخيص الحموية/ للشيخ عثيمين – ص٦٧). بۆیە ئێمەیش (وجه)مان بەرووخسار مانادایەوەو نەمانتوانی بیگۆڕین بە(زات، وجود)ی خوا، وەك هەندێ وای لێدەکەن، ئیمامی بەیهەقی لە کتێبی (الأسماء والصفات)دا ئەڵێت: (باب ما جاء في اثبات الوجه صفة لامن حيث الصورة لورود خبر الصادق به..) و ئەم ئایەتانەیشی هێناوە: ٥٥/٢٧، ٢٨/٨٨، ٩/٣٩، ٢٢/٣٠، ٦٧/٢٠، ١٣/٥٢، ٦/٩٢.. لەگەڵ هێنانی فەرمووده گەلێکدا کەپێشەوا (بوخاریی وموسلیم) هێناویانە بۆچەسپاندنی سیفەتی (وجه) بۆخوای گەورە –جل جلالە– ئومێدەوارم بەوردی بیری لێ بکرێتەوە، وەك ئیمامی بەیهەقیش دەڵێت دەبێت وەك سیفەتێك سەیربکرێت، واتە: کاتێ باسی (وجه) دەکرێت نابێ جۆرە ڕووخسارو دەم وچاوێك بێنیتە پێش چاوخۆت، چونکە (ليس كمثله شيء).﴿[٢٨] فبأي آلاء ربكما تكذبان﴾ جا بەکام نیعمەت لەنیعمەتەکانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن؟! ئەم مردنەش کردنەوەی دەرگایەکە بۆ ژیانی هەتاهەتایی ورزگاربوونە –بەتەواوی– لەمردن، دیارە ئەمەش لەخۆیدا هەرنیعمەت وبەهرەیە ﴿[٢٩] يسأله من في السموات والأرض﴾ هەمووگیانلەبەران و زیندەوەران کە لەئاسمانەکان و زەویدان بەردەوام بەزمانی حاڵ داوای پێداویستییەکانیان

لێدەکەن ,نیازمەندی ئەون، ئیتر بەزمان داوابکەن یان نەیکەن" ﴿کل یوم هو فی شأن﴾ هەموو ڕۆژێك وکاتێك، وا لە کارێك لە کارەکاندا: یەکێك دەمرێنێ و یەکێك لەدایك دەبێ، یەکێك سەرئەکەوێ و یەکێك دەشکێ..هتد. (ئیبن جەریر) دەڵێ: لە مانای (کل یوم هو فی شأن) پرسیار لەپێغەمبەر ﷺ کرا؟ ئەویش فەرمووی: ((أن یغفر ذنبا، ویفرج کربا، ویرفع قوما، ویضع آخرین)). أخرجه إبن جریر مرفوعا، ورواه البخاری موقوفا. واتة: مانای ئەوەیە کە هەردەم خەریکە گوناهی ئەبەخشێ، دەرگایە گوشادئەکات، هۆزێ بڵند ئەکا، هۆزێکی دیکە نەویی ﴿٣٠ فبأی آلاء ربکما تکذبان﴾ جابە کام نیعمەت لەنیعمەتەکانیپەروەردگارتان باوەڕناکەن؟.

**هەڕەشە لە مرۆو جنۆکەکان:**

﴿٣١ سنفرغ لکم ایها الثقلان﴾ ئەی جنیی وئادەمیی بۆ بڕوا ناهێنن؟! خۆ لەمەودوا لێتان دەپرسینەوەو حیسابتان لەگەڵ دەکەین , دیارە ئەمە هەڕەشەیە، ئەگینا هیچ شتێك دەستی خواناگرێ بۆئەنجامدانی ئیشێکیتر تاپێویست بکات بۆخۆ یەکلا کردنەوە ﴿٣٢ فبأی آلاء ربکما تکذبان﴾ جا بەکام نیعمەت لەنیعمەتەکانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن؟! ئەوە کەئێمە ئێستا سزاتان نادەین، هەرئەوە بەهرەیەکی گەورەیە بۆتان ﴿٣٣ یا معشر الجن والإنس إن استطعتم أن تنفذوا من أقطار السموات والأرض﴾ ئەی کۆمەڵی جن وئادەمیی! ئەگەر ئەتوانن لە ئاسۆی ئاسمانەکان و زەویەوە لەدەسەلاتم دەرچن ودەربازبن ﴿فانفذوا﴾ دەسا دەرچن ﴿لا تنفذون إلا بسلطان﴾ دەریش ناچن مەگەر بە هۆی دەسەلات و هێزێك ,خۆ ئەو دەسەلات وهێزەشتان نیە تادەرچن ﴿٣٤ فبأی آلاء ربکما تکذبان﴾ جائیتر بەکام نیعمەت لە نیعمەتەکانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن؟ ﴿٣٥ یرسل علیکما شواظ من نار ونحاس﴾ ناتوانن دەرباز بن، چونکە گڕو بڵێسەیەکی چڕو پڕلەئاگرێکی بێ دووکەڵ ومسیی تواوەتان بۆرەوانە دەکرێ و ئەتان سوتێنێ ﴿فلا تنتصران﴾ جاناشتوانن ئەو سزایە لە خۆتان دەفع بکەن ﴿٣٦ فبأی آلاء ربکما تکذبان﴾ جا ئیتر بەکام نیعمەت لە نیعمەتەکانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن ئەی گرۆی ئادەمی پەریی؟!.

**ئاسمان قەڵش دەباو ڕەنگی گوڵی سوور دەنوێنێ:**

﴿٣٧ فاذا انشقت السماء﴾ جا کاتێ ئەم ئاسمانە لەت بوو وئەونیزامەی ئێستای نەما ﴿فکانت وردة کالدهان﴾ ئینجا سوور هەڵگەڕا وەك ڕۆن زەیت (موجاهید و زەحاك و..(ئەڵێن: (الدِّهان: الدُّهْن) والمعنی: أنها صارت فی صفاء الدهن، والدهان علی هذا جمع دهن، وقال سعید بن جبیر وقتادة: المعنی فکانت حمراء وقیل: المعنی تصیر فی حمرة الورد وجریان الدهن، أی تذوب مع الإنشقاق حتی تصیر حمراء من حرارة نار جهنم). بەڵێ تەواوی ئەوئایەتانەی کە باسی بەسەرهاتە سەختەکانی بوونەوەر ئەکەن – لەڕۆژی قیامەتدا– هەر هەموویان ئاماژە بەوەئەکەن کە ئەم بوونەوەرە نامێنێ, پاش ئەوەی ئەم ڕژێمەی ئێستای نەما، جاقورئانی پیرۆز بەچەندین شێوە ئەوحاڵەتە دەخاتە ڕوو: (إذا رجت الأرض رجا) (٤/٥٦) (فإذا برق البصر وخسف القمر) (٧٥/ ٧–٨).. (إذا الشمس کورت، وإذا النجوم انکدرت) (٨١/١–٢).. (إذا السماء انفطرت) (٨٢/١).. (إذا السماء إنشقت) (٨٤/١).. ئەمانەو چەندین ئایەتیتر پەنجە ئەخەنەسەر وێرانبوونی ئەم بوونەوەرە کەلەڕاستیدا تەنهاخوای گەورە هەرخۆی کونهوو حەقیقەتی ئەزانێ, جاکاتێ ڕەنگی ئاسمان وەکو ڕۆنی گەرمکراوی تواوە –یاوەکو گوڵاڵە سوورەی لێهات – دیارە ئەمە شێوەیەکی قورسی ڕۆژی قیامەتە مەگەر تەنها خوای گەورە – بەتەواویی– لێی تێبگات ﴿٣٨ فبأی آلاء ربکما تکذبان﴾ جابەکام نیعمەت لەنیعمەتەکانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن؟ ﴿٣٩ فیومئذ لا یسأل عن ذنبه إنس ولاجان﴾ ئینجا ئەوڕۆژە کەئاسمان لەت بوو,پرسیار لەگوناهی ئادەمیی وجنیی ناکرێ, چونکە بەدەم و چاوو ڕەنگ و

رووخساریاندا ئەناسرێن، پێویست بەپرسیار ناکات، وەك ئەفەرموێ: (هذا یوم لا ینطقون، ولا یؤذن لهم فیعتذرون) (٧٧/٣٥-٣٦). بەڵام لەهەندێ وێستگەدا پرسیاریان لێ دەکرێ: (فوربك لنسألنهم أجمعين عما كانوا يعملون)(١٥/٩٢-٩٣). ﴿٤٠ فبای آلاء ربكما تكذبان﴾ جا بەکام نیعمەت لەنیعمەتەکانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن؟ ﴿٤١ يعرف المجرمون بسيماهم﴾ تاوانباران بەنیشانەکانی دیمەنیاندا ئەناسرێنەوە:دەموچاوی رەشیان، چاوی ئەبڵەقی‌شینیان ﴿فيؤخذ بالنواصي والأقدام﴾ جا فریشتەکان بەمووی پێشی‌سەروو بەلاق ئەیانگرن وگلۆلەیان دەکەن وفڕێیان دەدەنە ناوئاگری دۆزەخەوە ﴿٤٢ فبأی آلاء ربكما تكذبان﴾ جا بە کام نیعمەت و بەهرەکانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن؟ جا بۆ ئەوەی زیاتر ئێشیان پێبگات پێیان ئەوترێ: ﴿٤٣ هذه جهنم التی يكذب بهاالمجرمون﴾ ئەمە ئەو دۆزەخەیە کەتاوانباران بڕوایان پێ نەدەکرد ﴿٤٤ يطوفون بينها وبين حميم آن﴾ لەنێوان دۆزەخ و ئاوێکی کوڵ بە کوڵ دێن ودەچن. ﴿٤٥ فبأی آلاء ربكما تكذبان﴾ جا بەکام نیعمەت لە نیعمەتەکانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن؟

يَعۡرَفُ ٱلۡمُجۡرِمُونَ بِسِيمَٰهُمۡ فَيُؤۡخَذُ بِٱلنَّوَٰصِي وَٱلۡأَقۡدَامِ ﴿٤١﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٢﴾ هَٰذِهِۦ جَهَنَّمُ ٱلَّتِي يُكَذِّبُ بِهَا ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴿٤٣﴾ يَطُوفُونَ بَيۡنَهَا وَبَيۡنَ حَمِيمٍ ءَانٖ ﴿٤٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٥﴾ وَلِمَنۡ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ جَنَّتَانِ ﴿٤٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٧﴾ ذَوَاتَآ أَفۡنَانٖ ﴿٤٨﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٩﴾ فِيهِمَا عَيۡنَانِ تَجۡرِيَانِ ﴿٥٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥١﴾ فِيهِمَا مِن كُلِّ فَٰكِهَةٖ زَوۡجَانِ ﴿٥٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٣﴾ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ فُرُشِۭ بَطَآئِنُهَا مِنۡ إِسۡتَبۡرَقٖۚ وَجَنَى ٱلۡجَنَّتَيۡنِ دَانٖ ﴿٥٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٥﴾ فِيهِنَّ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرۡفِ لَمۡ يَطۡمِثۡهُنَّ إِنسٞ قَبۡلَهُمۡ وَلَا جَآنّٞ ﴿٥٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٧﴾ كَأَنَّهُنَّ ٱلۡيَاقُوتُ وَٱلۡمَرۡجَانُ ﴿٥٨﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٩﴾ هَلۡ جَزَآءُ ٱلۡإِحۡسَٰنِ إِلَّا ٱلۡإِحۡسَٰنُ ﴿٦٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦١﴾ وَمِن دُونِهِمَا جَنَّتَانِ ﴿٦٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦٣﴾ مُدۡهَآمَّتَانِ ﴿٦٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦٥﴾ فِيهِمَا عَيۡنَانِ نَضَّاخَتَانِ ﴿٦٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦٧﴾

### میوانداریی بەهەشتییەکان:

﴿٤٦ ولمن خاف مقام ربه جنتان﴾ وەبۆ هەرکەسێك لە جێگای وەستانی خۆی لەبەردەم پەروەردگاری خۆی دەترسێ - لەوە فەرمانەکانی خوای بۆ جێبەجێ نەبێ- دووبەهەشتی گەورەهەیە, بەهەشتێك بۆسوکناو جێگای خۆی، بەهەشتێکیش بۆ خاوو خێزانی، یابەهەشتێك لەبەرامبەر جێبەجێکردنی فەرمانەکانی خواوەو، ئەوی دیکەشیان بەهۆی نەکردنی قەدەغەکراوەکانیەوە, ئەمەیە کە خوا ئەفەرموێ: (وأما من خاف مقام ربه ونهى النفس عن الهوى فإن الجنة هی المأوى)(٧٩/٤٠-٤١). پێغەمبەریش ﷺ ئەفەرموێ: ((جنتان من فضة آنيتهما وما فيهما، وجنتان من ذهب آنيتهما وما فيهما، وما بين القوم وبين أن ينظروا إلى ربهم -عز وجل- إلا رداء الكبرياء على وجهه فی‌جنة عدن))أخرجه البخاری: (فتح الباری: ٨/٤٩١). ﴿٤٧ فبأی آلاء ربكما تكذبان﴾ جا بەکام نیعمەت لە نیعمەتەکانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن؟ ﴿٤٨ ذواتا افنان﴾ خاوەنانی گەڵاداری تازە ,واتە:دارو درەختی گەڵاناسك و جوانی تێدایە ﴿٤٩ فبأی آلاء ربكما تكذبان﴾ جا بەکام نیعمەت لەنیعمەتەکانی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن ﴿٥٠ فيهما عينان تجريان﴾ لەنێو دوو بەهەشتەکەدا دوو کانیاوی رەوان هەیە: (تەسنیم) و(سەلسەبیل) ﴿٥١ فبأی آلاء ربكما تكذبان﴾ جا بە کام نیعمەت لەنیعمەتەکانی پەروەردگارتان باوەڕناکەن؟ ﴿٥٢ فيهما من كل فاكهة زوجان﴾ لە نێویاندا لە هەمووجۆرە میوەیەك دوو جۆری تێدایە ﴿٥٣ فبأی آلاء ربكما تكذبان﴾ جاب ە کام نیعمەت لە نیعمەتەکانی پەروەردگارتان حاشادەکەن؟ ﴿٥٤ متكئين على فرش بطائنها من استبرق﴾ لەو بەهەشتانەدا لەسەر رایەخگەلێ - کە ناوەخنەکەیان لەپارچە ئاوریشمی ئەستووری تایبەتە - پاڵیان

داوەتەوە ﴿وجنى الجنتين دان﴾ میوەو بەری دوو بەهەشتەکەیش نزیکە دەستە , هەموو کەسێك بەئاسانی دەستی
ئەیگاتێ: بەپێوە، بەدانیشتن، بێ هیچ جۆرە ماندووبوونێك ﴿٥٥ فبأى آلاء ربكما تكذبان﴾ جا بەکام نیعمەت
لەنیعمەتەکانی پەروەردگارتان حاشا دەکەن؟ ﴿٥٦ فيهن قاصرات الطرف﴾ ژنانێکیان تێدایە تەنها سەیری
مێردەکانی خۆیان ئەکەن ﴿لم يطمثهن إنس قبلهم ولا جان﴾ بەر لەومێردەبەهەشتیانەیان, کەسێ -لە ئادەمیی ولە
جنیی- لە گەڵیان جووت نەبووە ﴿٥٧ فبأى آلاء ربكما تكذبان﴾ جا بە کام نیعمەت لە نیعمەتەکانی پەروەردگارتان
باوەڕناکەن؟﴿٥٨ كأنهن الياقوت والمرجان﴾ لە جوانی وساف وسوورییدا (حۆریەکان) دەڵێیت یاقوت وشیلانن ﴿٥٩
فبأى آلاء ربكما تكذبان﴾ جا بەکام نیعمەت لە نیعمەتەکانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن؟ ﴿٦٠ هل جزاء الإحسان إلا
الإحسان﴾ مەگەر پاداشتی چاکە تەنهاچاکە نیە؟ واتە: ئەوانە لەدونیادا کاری چاکیان ئەنجامدا، وا ئێستاش
چاکەیان لەگەڵ ئەکرێ ﴿٦١ فبأى آلاء ربكما تكذبان﴾ جا بە کام نیعمەت لەنیعمەتەکانی پەروەردگارتان باوەڕ
ناکەن؟ ﴿٦٢ ومن دونهما جنتان﴾ بێجگە لەودوو بەهەشتە باسکران, دوو بەهەشتی تریشیان بۆ هەیە ﴿٦٣ فبأى آلاء
ربكما تكذبان﴾ جابە کام نیعمەت لەنیعمەتەکانی پەروەردگارتان باوەڕناکەن؟ ﴿٦٤ مدهامتان﴾ رەنگ قەرسیلین لە
سەوزیی وتێراویدا ﴿٦٥ فبأى آلاء ربكما تكذبان﴾ جا بە کام نیعمەت لەنیعمەتەکانی پەروەردگارتان باوەڕناکەن؟!
﴿٦٦ فيهما عينان نضاختان﴾ دووکانیاوی هەڵقوڵاویفیچقەکەریان تێدایە ﴿٦٧ فبأى آلاء ربكما تكذبان﴾ جا بە کام
نیعمەت لە نیعمەتەکانی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن؟ ﴿٦٨ فيهما فاكهة ونخل ورمان﴾ جۆراوجۆر درەختی میوەو
دارخورماو هەناریان تێدایە ﴿٦٩ فبأى آلاء ربكما تكذبان﴾ جا بە کام بەخششی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن؟ ﴿٧٠
فيهن خيرات حسان﴾ ژنانی رەوشت شیرین و روخسار جوانیان تێدایە ﴿٧١ فبأى آلاء ربكما تكذبان﴾ جابە کام
نیعمەت لەنیعمەتەکانی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن ﴿٧٢ حور مقصورات فى الخيام﴾ ژنانیسپیی چاو رەشن, لەناو
خێوەت وچادرەکاندا دەرناچن. (حور: جمع حوراء، وهي الشديدة البياض العين الشديدة سوادها قال عمر ﷺ
الخيمة درة مجوفة).﴿٧٣ فبأى آلاء ربكما تكذبان﴾ جا بە کام نیعمەت لەنیعمەتەکانی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن؟
﴿٧٤ لم يطمثهن إنس قبلهم ولا جان﴾ بەر لەبەهەشتیەکان هیچ ئادەمیی و، هیچ جنیەك دەستی بۆ نەبردوون و
کچێتی لا نەبردوون ﴿٧٥ فبأى آلاء ربكما تكذبان﴾ جابە کام نیعمەت لەنیعمەتەکانی پەروەردگارتان حاشا دەکەن؟
﴿٧٦ متكئين على رفرف خضر وعبقرى حسان﴾ لەسەر پشتیی سەوزو قاڵی نایاب - کەوێنەیان لەدونیادا نیە-
شانیان داداوە. عەرەبەکان هەرشتێکی سەیرو جوایان دیتبا ئەیانوت: ئەڵێت لەشێوەی (عەبقەر) دروستکراوە ﴿٧٧
فبأى آلاء ربكما تكذبان﴾ جابە کام نیعمەت لەنیعمەتەکانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن؟ ﴿٧٨ تبارك اسم ربك ذى
الجلال والإكرام﴾ پڕ بەرەکەتە ناوی پەروەردگاری خاوەن گەورەیی وئیحسانت.

لە (١٧)ی شەعبانی (١٤١٧)ك بەرامبەر بە (١٩٩٦/١٢/٢٧) دوای نوێژی هەینیی، کات
ژمێر(٢/٥٤)دەقیقە.لەنووسینی تەفسیری ئەم سوورەتە بوومەوە لە شارۆچکەی مەریوانی کوردستانی ئێران.

*** *** ***

## ٥٦- سوورەی (واقیعه) یە

## مەککەییەو (٩٦) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتە باسی رۆژەسەختەکەی قیامەت دەکات، کە چ رۆژێکی گران وسەختە! ئەوجا ئادەمزاد دەکا بەسێ بەشەوە: (أصحاب اليمن، أصحاب الشمال، سابيقون).. ئینجا پاشەرۆژی هەریەکێکیان دەست نیشان ئەکات و.. چەند بەڵگەیەکیش دێنێت لەسەر دەسەڵات و بوونی خوای گەورە، لە دروستکردنی ئادەمزادو، رواندنی رووەك و، باراندنی باران، پاشان باسێکی قورئانیش ئەکات.. کۆتاییشی دێت بەدیاریکردنی چارەنووس وجێگاو شوێنی هەرسێدەستە کە: دەستەیبەختیاران، دەستەی بەدبەختان، دەستەی پێشخەران لەئەنجامدانی خێروخێراتدا، پاداشت و تۆڵەی هەموانیش هەڵدەسەنگێنێ.

الجزء السابع والعشرون — سورة الواقعة

فِيهِمَا فَٰكِهَةٌ وَنَخۡلٌ وَرُمَّانٌ ﴿٦٨﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦٩﴾
فِيهِنَّ خَيۡرَٰتٌ حِسَانٌ ﴿٧٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧١﴾ حُورٌ
مَّقۡصُورَٰتٌ فِي ٱلۡخِيَامِ ﴿٧٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧٣﴾
لَمۡ يَطۡمِثۡهُنَّ إِنسٌ قَبۡلَهُمۡ وَلَا جَآنٌّ ﴿٧٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ
﴿٧٥﴾ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ رَفۡرَفٍ خُضۡرٍ وَعَبۡقَرِيٍّ حِسَانٍ ﴿٧٦﴾ فَبِأَيِّ
ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧٧﴾ تَبَٰرَكَ ٱسۡمُ رَبِّكَ ذِي ٱلۡجَلَٰلِ وَٱلۡإِكۡرَامِ ﴿٧٨﴾

سُورَةُ الوَاقِعَةِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِذَا وَقَعَتِ ٱلۡوَاقِعَةُ ﴿١﴾ لَيۡسَ لِوَقۡعَتِهَا كَاذِبَةٌ ﴿٢﴾ خَافِضَةٌ رَّافِعَةٌ
﴿٣﴾ إِذَا رُجَّتِ ٱلۡأَرۡضُ رَجًّا ﴿٤﴾ وَبُسَّتِ ٱلۡجِبَالُ بَسًّا ﴿٥﴾
فَكَانَتۡ هَبَآءً مُّنۢبَثًّا ﴿٦﴾ وَكُنتُمۡ أَزۡوَٰجًا ثَلَٰثَةً ﴿٧﴾ فَأَصۡحَٰبُ
ٱلۡمَيۡمَنَةِ مَآ أَصۡحَٰبُ ٱلۡمَيۡمَنَةِ ﴿٨﴾ وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡمَشۡـَٔمَةِ مَآ أَصۡحَٰبُ
ٱلۡمَشۡـَٔمَةِ ﴿٩﴾ وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلسَّٰبِقُونَ ﴿١٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلۡمُقَرَّبُونَ ﴿١١﴾
فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿١٢﴾ ثُلَّةٌ مِّنَ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٣﴾ وَقَلِيلٌ مِّنَ ٱلۡأٓخِرِينَ
﴿١٤﴾ عَلَىٰ سُرُرٍ مَّوۡضُونَةٍ ﴿١٥﴾ مُّتَّكِـِٔينَ عَلَيۡهَا مُتَقَٰبِلِينَ ﴿١٦﴾

يطوف عليهم ٥٣٤

### رۆژی پەسڵان قۆناغ بە قۆناغ دێ:

﴿بسم الله الرحمن الرحيم * ١ إذا وقعت الواقعة﴾ کاتێ رووداوە گەورەکە (رۆژی قیامەت) روویدا, کە هەرپێش دێت, وەك ئەفەرموێ: (فيومئذ وقعت الواقعة) (١٥/٦٩). ﴿٢ ليس لوقعتها كاذبة﴾ بۆ رووداني هيچ درۆیەك نیە , تا بڕوابەهاتنی نەکرێ، هەرچەند ئەمرۆ هەندێ کەس بڕوای پێ ناکات (وەك ئەم ئایەتەش ئەوراستییە دەڵێ: (استجيبوا لربكم من قبل أن يأتي يوم لا مردله من الله..)(٤٢/٤٣). یاخود ئەفەرموێ: (سأل سائل بعذاب واقع، للكافرين ليس له دافع)(٧٠/١-٢). ﴿٣ خافضة رافعة﴾ نزمکەرەوەی بەدبەختانە، بەرزکەرەوەی بەختیارانە، واتە: خەڵکی دەبێتە دوودەستەوە، هەندێکی ریسواو خەجاڵەت، ئەوی تریشی پایەبڵندو سەربەرز ﴿٤ إذا رجت الأرض رجا﴾ وەختێ زەوی بەلەرزە خرا بەلەرزە خرانێکیتوند، وەك دەفەرموێ: (إذا زلزلت الأرض زلزالها)(٩٩/١). یان (إن زلزلة الساعة شئ عظيم)(٢٢/١). بۆپشتیوانی توندییو سەخڵەتی ئەورووداوە. ﴿٥ وبست الجبال بسا﴾ و کێوەکانیش هەپروون هەپروون کران,وەك سوورمە داڕێژران ﴿٦ فكانت هباء منبثا﴾ ئینجا بوونە تۆزێکی بڵاوە بوو.

### رۆژی بەرێ مەردم دەبێتە سێ دەستە:

﴿٧ وكنتم أزواجا ثلاثة﴾ وئەوکاتە (قیامەت هات)ئێوە بوونە سێ دەستەوە، ئیتر تەواوی راستیەکان دەرئەکەون وهەمووکەسێك پاداشت وتۆڵەی خۆی وەرئەگرێتەوە: ﴿٨ فأصحاب الميمنة ما أصحاب الميمنة﴾ ئینجا هاوەڵانی لای راست، چین هاوەڵانی لای راست، واتە: تۆ چووزانیت لە چ حاڵێکی خۆشدان؟ ﴿٩ وأصحاب المشئمة ما أصحاب المشئمة﴾ وەهاوەڵانی لایچەپ، چین هاوەڵانی لای چەپ , واتە:تۆچووزانیت چەندە بەد بەختن؟! ﴿١٠ والسابقون

﴿السابقون﴾ پێشکەوتووەکان، ئەوانەی پێشکەوتن بەخەیرات لەدنیادا، هەمیشە پێشەنگبوون بۆبەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوا، واتە: لە هەمووکارێکی چاکدا سەرقافڵە بوون: بۆجیهاد، بۆهاوکاری هەژاران...هتد. ئایەتی (ثم أورثنا الكتاب الذين اصطفينا من عبادنا فمنهم ظالم لنفسه ومنهم مقتصد ومنهم سابق بالخيرات بإذن الله)(٣٢/٣٥). بۆ جەخت لە سەر ئەومانایەیە. هەروەها ئایەتی (وسارعوا إلى مغفرة من ربكم وجنة عرضها السموات والأرض)(٢١/٥٧). یان (سابقوا إلى مغفرة من ربكم وجنة عرضها كعرض السماء والأرض). ﴿[11] اولئك المقربون﴾ ئا ئەوانە نزیکخراوەکانن ﴿[12] فی جنات النعيم﴾ لەناوباخاتی خۆشگوزەرانیدان ,هەرچی مەیل بکەن ئامادە دەکرێ بۆیان ﴿[13] ثلة من الأولين﴾ ئەو نزیکانە کۆمەڵێکی زۆرن لەئوممەتانی پێشوو و زووچوون بەدەم بانگەوازی خواوە ﴿[14] وقليل من الآخرين﴾ وکەمێکیش لەپاشینانن، واتە:ئەوانە لەم ئوممەتی پێغەمبەرەن ﷺ، ئەم فەرموودەیشە هەرپشتگیری ئەو مانایە دەکا: ((خير القرون قرني ثم الذين يلونهم ثم الذين يلونهم..)) بوخاری: ٣٦٥١. واتە: باشترینی خەڵکانی سەدەکان، سەردەم وخەڵکانی سەدەکەی منە، پاشان ئەوانەن وابەدوای ئەواندا دێن، دیسانەوە ئەوانەش کەلەدوای ئەوانیشەوە دێن. کەوابوو دەستەی یەکەمی هەمووئوممەت و گەلێك - لە شەریعەتی ئیسلامدا- لەوی پاش خۆی چاکترو باشترە. ((نحن الآخرون السابقون يوم القيامة)) -واتە: ئێمە پاشینانی پێشەنگانین لەرۆژی قیامەتدا- فەرمودەی خۆیەتی، (ئیبنی جەریر هێناویەتی" فتح الباري: ٥٢٦/١١. ﴿[15] على سرر موضونة﴾ لەسەر قەنەفەوتەختی چنراو بەزێر دانیشتوون ﴿[16] متكئين عليها متقابلين﴾ بەسەریانەوە ڕووبەڕووی یەك شانیان داداوە,کە ئەمەش جوانترین شێوەی دانیشتنە ﴿[17] يطوف عليهم ولدان مخلدون﴾ کۆمەڵە منداڵێکی ئێسك سووك و هەمیشە لاو خزمەتیان دەکەن و دەگەڕێن بەسەریاندا ﴿[18] بأكواب وأباريق وكأس من معين﴾ بەگۆزەو سوراحیی وپێکی پڕ لەشەرابی چۆمە ڕەوانەکانی بەهەشتەوە ﴿[19] لا يصدعون عنها﴾ سەریان پێی ئێش ناکا ﴿ولا ينزفون﴾ و هۆشیشیان نابرێ بەوەی سەرخۆش بن، واتە: وەك شەرابی ئەم دونیایە توشی قسەی پەتەڕییان ناکەن ﴿[20] وفاكهة مما يتخيرون﴾ ودەگەڕێن بەجۆرەهامیوە, لەهەر جۆرێ هەڵیئەبژێرن ﴿[21] ولحم طير مما يشتهون﴾ ودەدەڕێن بە گۆشتی پەلەوەرەوە, لە هەر جۆرێکی حەزی لێ بکەن ﴿[22] وحور عين﴾ و ژنانی چاوبەڵەك و چاوگەورەو سپی پێست و دەم وچاودرەخشانیان بۆهەیە ﴿[23] كأمثال اللؤلؤ المكنون﴾ لەپاك وخاوێنیی و جوانیی و ساف وبێ گەردیی و دەست لێنەکەوتوییدا، دەڵێیت مرواریی نێوسەدەفن ﴿[24] جزاء بما كانوا يعملون﴾ ئەو نیعمەتانە لە پاداشی کاروکردەوەی چاکیاندایە ﴿[25] لا يسمعون فيها لغوا ولا تأثيما﴾ لەوێدا هیچ جۆرە قسەیەکی هیچ وپووچ و نابەجێ، وەهیچ شتێك کەمایەی تووشبوونی گوناح بێت نابیسن

الجزء السابع والعشرون سُورَةُ الوَاقِعَةِ

يَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَانٌ مُّخَلَّدُونَ ﴿١٧﴾ بِأَكْوَابٍ وَأَبَارِيقَ وَكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍ
﴿١٨﴾ لَّا يُصَدَّعُونَ عَنْهَا وَلَا يُنزِفُونَ ﴿١٩﴾ وَفَٰكِهَةٍ مِّمَّا يَتَخَيَّرُونَ
﴿٢٠﴾ وَلَحْمِ طَيْرٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ ﴿٢١﴾ وَحُورٌ عِينٌ ﴿٢٢﴾ كَأَمْثَٰلِ ٱللُّؤْلُؤِ
ٱلْمَكْنُونِ ﴿٢٣﴾ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٢٤﴾ لَا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا
تَأْثِيمًا ﴿٢٥﴾ إِلَّا قِيلًا سَلَٰمًا سَلَٰمًا ﴿٢٦﴾ وَأَصْحَٰبُ ٱلْيَمِينِ مَآ أَصْحَٰبُ
ٱلْيَمِينِ ﴿٢٧﴾ فِى سِدْرٍ مَّخْضُودٍ ﴿٢٨﴾ وَطَلْحٍ مَّنضُودٍ ﴿٢٩﴾ وَظِلٍّ مَّمْدُودٍ
﴿٣٠﴾ وَمَآءٍ مَّسْكُوبٍ ﴿٣١﴾ وَفَٰكِهَةٍ كَثِيرَةٍ ﴿٣٢﴾ لَّا مَقْطُوعَةٍ وَلَا
مَمْنُوعَةٍ ﴿٣٣﴾ وَفُرُشٍ مَّرْفُوعَةٍ ﴿٣٤﴾ إِنَّآ أَنشَأْنَٰهُنَّ إِنشَآءً ﴿٣٥﴾ فَجَعَلْنَٰهُنَّ
أَبْكَارًا ﴿٣٦﴾ عُرُبًا أَتْرَابًا ﴿٣٧﴾ لِّأَصْحَٰبِ ٱلْيَمِينِ ﴿٣٨﴾ ثُلَّةٌ مِّنَ
ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٣٩﴾ وَثُلَّةٌ مِّنَ ٱلْءَاخِرِينَ ﴿٤٠﴾ وَأَصْحَٰبُ ٱلشِّمَالِ مَآ أَصْحَٰبُ
ٱلشِّمَالِ ﴿٤١﴾ فِى سَمُومٍ وَحَمِيمٍ ﴿٤٢﴾ وَظِلٍّ مِّن يَحْمُومٍ ﴿٤٣﴾ لَّا بَارِدٍ
وَلَا كَرِيمٍ ﴿٤٤﴾ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَبْلَ ذَٰلِكَ مُتْرَفِينَ ﴿٤٥﴾ وَكَانُوا۟ يُصِرُّونَ
عَلَى ٱلْحِنثِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٤٦﴾ وَكَانُوا۟ يَقُولُونَ أَئِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا
وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ ﴿٤٧﴾ أَوَءَابَآؤُنَا ٱلْأَوَّلُونَ ﴿٤٨﴾ قُلْ إِنَّ
ٱلْأَوَّلِينَ وَٱلْءَاخِرِينَ ﴿٤٩﴾ لَمَجْمُوعُونَ إِلَىٰ مِيقَٰتِ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴿٥٠﴾

٥٣٥

﴿٢٦ الا قیلا سلاما سلاما﴾ جگەلە سەلام کردن لە یەکترو، سەلام وەڵامدا نەوەنەبێت شتێکی تر نیە، فریشتە سەلامیان لێئەکات، خۆیان لەخۆیان سەلام ئەکەن، لەلایەن خواوە سەلامیان پێ ئەگات.

**بەکورتیی:** کەش وهەوایەکی پڕ لەسەلامە.

**دەستەی ڕاستان و جەزاکەیان:**

﴿٢٧ وأصحاب الیمین ما أصحاب الیمین﴾ یارانی لای ڕاست، چین یارانی لای ڕاست ، واتە، چەندە بەختەوەرو لە کامەرانیدان وەك دفەرمووێ: ﴿٢٨ فی سدر مخضود﴾ لەژێر سێبەری داری مۆردی بێدڕکدان "کە لەجێگەی هەردڕکێکدا بەرێکە. پێشەوا (بەیهەقی وحاکم) دەگێڕنەوە کە: عەرەبێکی دەشتەکی وتی: ئەی پەیامبەر ﷺ! خوای گەورە باسی درەختی دڕکاوی لەبەهەشتدا ئەکا! پێغەمبەریش فەرمووی ئایا ئەزانی ئەودرەختە کامەیە؟ وتی: داری (سدر)ە. پەیامبەر ﷺ فەرمووی: ئەوەنیە خوا دەفەرمویٚ: (فی سدر مخضود) واتە: دڕکەکانی بڕاوون و، وە لەجێگەی هەردڕکێکدا میوەیەکی داناوە.. ﴿٢٩ وطلح منضود﴾ و لەبن سێبەری داری مۆزی بەر بەسەریەککەوتوودان ، لەبەر زۆری مۆزەکەی قەدی لاسکەکەی دیارنیە ﴿٣٠ وظل ممدود﴾ ولەژێر سێبەری بەردەوام و دوورو درێژدان کە هەرگیز خۆر نایسرێتەوەو هەمیشە هەر سێبەرە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((إن فی الجنة شجرة یسیر الراکب فی ظلها مأة عام لا تقطعها، إقرؤا إن شئتم: وظل ممدود)). فتح الباري: ٤٩٥/٨. لەبەهەشتدا درەختێك هەیە سوار چاك سەدساڵ بەژێر سێبەرەکەیدا دەڕوات هێمان هەرتەواونابێت، حەزئەکەن ئایەتی: (وظل ممدود) بخوێننەوە. ﴿٣١ وماء مسکوب﴾ ولەنزیکی تاڤگەوئاوێکدان دەڕژێتە خوار ﴿٣٢ وفاکهة کثیرة﴾ ولەناو میوەیەکی زۆردان ﴿٣٣ لا مقطوعة ولا ممنوعة﴾ نە دەبڕێ و، نەقە دەغە دەکرێت ﴿٣٤ وفرش مرفوعة﴾ وە لەسەر ڕایەخگەلێکی بەنرخن ﴿٣٥ إنا انشاناهن إنشاء﴾ بەڕاستیی ئێمە ژنانی بەهەشتمان دروستکردوون بەدروستکردنێکی تازە ،شۆخ و شەنگ وجوان ،وەك ژنانی دونیا نین،هەندێ گۆڕانیان بەسەردا بێت ﴿٣٦ فجعلناهن ابکارا﴾ جا کردوومانن بەکچ، واتە: هەمیشە کچن ووەك کیژانی شوونەکردوون ﴿٣٧ عربا أترابا﴾ مێرد خۆشەویستانێ هاوساڵ و هاوتەمەن ﴿٣٨ لاصحاب الیمین﴾ ئەمانە هەموو بۆ یارانیلای ڕاست وبەختەوەرن، ئەوا نەی کە نامەی کردەوەیان بە دەستی ڕاستیانەوە ئەدرێ ﴿٣٩ ثلة من الاولین﴾ کۆمەڵێکی زۆرن لە پێشینان ﴿٤٠ وثلة من الآخرین﴾ کۆمەڵێکی زۆریشن لە پاشینانان ,واتە: لە ئۆمەتی پێغەمبەرن ﷺ. (ئیبن عەباس) ئەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەبارەی تەفسیری (ثلة من الاولین و ثلة من الآخرین)دا فەرمووی: ((هم جمیعا من أمتی)) لەڕیوایەتێکی تردا: ((الثلثان جمیعا من أمتی)) ذکره ابن حجر فی(الکافی الشافی) فی تخریج أحادیث الکشاف. واتە ئەوپێشینان وپاشینانە، گشت لەئوممەتی منن.

**یارانی لای چەپ و تۆڵەیان:**

﴿٤١ وأصحاب الشمال ماأصحاب الشمال﴾ و یارانی لای چەپ، چین یارانی لای چەپ؟ مەگەر خوا بزانێ حاڵیان چەند بەد حالە؟! ئەو کەسانەن کەنامەی کارەکانیان بەدەستی چەپیانەوە دەدرێت ﴿٤٢ فی سموم وحمیم﴾ لەناو گەرمای ئاگرێکی دۆزەخ و ئاوێکی کوڵ بەکوڵدان ﴿٤٣ وظل من یحموم﴾ لەژێر سێبەری چڕە دووکەڵێکی زۆر ڕەشدان ﴿٤٤ لابارد ولا کریم﴾ نەسێبەرێکی فێنکە لە گەرما کەم بکاتەوە،وەنەدیمەنێکی جوانیشی هەیە ﴿٤٥ إنهم کانوا قبل ذلك مترفین﴾ چونکە ئەوانە لە پێش ئەوەدا- واتە: لەدونیادا- لەناونیعمەتدا رایان دەبوارد گوێیان بەوە نەئەدا کەپەیامبەرەکەیان پێی ڕائەگەیاندن، بۆیە وائێستا دووچاری ئەوسزایە بوون ﴿٤٦ وکانوا یصرون علی الحنث

العظيم﴾ و ئەوان هەردەم سوور بوون لەتاوانە گەورەكە، واتە: لەسەر شيرك ﴿٤٧ وكانوا يقولون أءذا متنا وكنا ترابا
وعظاما﴾ هەميشە دەيانوت: ئايا كاتێ مردين و بووينە گڵ و ئێسك ﴿إءنا لمبعوثون﴾ ئايا بەتەئكيد زيندوو
ئەكرێينەوە؟! ﴿٤٨ او آباؤنا الأولون﴾ هەتا باووباپيرانى پێشينانيشمان؟! ﴿٤٩ قل إن الاولين والآخرين﴾ ئەى
موحەممەد ﷺ بڵێ: بێگومان پێشينان و پاشينان و هەموو ﴿٥٠ لمجموعون إلى ميقات يوم معلوم﴾ كۆ ئەكرێنەوە
بۆكاتى رۆژێكى دياريكراو، ئەويش كاتى رۆژى قيامەتە ﴿٥١ ثم إنكم ايها الضالون المكذبون﴾ پاشان ئێوە ئەى
لارێ و گومراو كافرو نكوڵى كەران! ﴿٥٢ لآكلون من شجر من زقوم﴾ بێگومان لەبەروبوومى (زەققوم) -درەختێكە
لەناوەڕاستيى دۆزەخدا- ئەخۆن ﴿٥٣ فمالئون منها البطون﴾ لەبەر زۆر برسێتى، ورگ و زكتانى لێ پڕئەكەن گوێ

الجزء السابع والعشرون — سورة الواقعة

ثُمَّ إِنَّكُمْ أَيُّهَا ٱلضَّآلُّونَ ٱلْمُكَذِّبُونَ ﴿٥١﴾ لَءَاكِلُونَ مِن شَجَرٍ مِّن زَقُّومٍ ﴿٥٢﴾
فَمَالِـُٔونَ مِنْهَا ٱلْبُطُونَ ﴿٥٣﴾ فَشَٰرِبُونَ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْحَمِيمِ ﴿٥٤﴾ فَشَٰرِبُونَ
شُرْبَ ٱلْهِيمِ ﴿٥٥﴾ هَٰذَا نُزُلُهُمْ يَوْمَ ٱلدِّينِ ﴿٥٦﴾ نَحْنُ خَلَقْنَٰكُمْ فَلَوْلَا
تُصَدِّقُونَ ﴿٥٧﴾ أَفَرَءَيْتُم مَّا تُمْنُونَ ﴿٥٨﴾ ءَأَنتُمْ تَخْلُقُونَهُۥٓ أَمْ نَحْنُ
ٱلْخَٰلِقُونَ ﴿٥٩﴾ نَحْنُ قَدَّرْنَا بَيْنَكُمُ ٱلْمَوْتَ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ ﴿٦٠﴾
عَلَىٰٓ أَن نُّبَدِّلَ أَمْثَٰلَكُمْ وَنُنشِئَكُمْ فِى مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٦١﴾ وَلَقَدْ
عَلِمْتُمُ ٱلنَّشْأَةَ ٱلْأُولَىٰ فَلَوْلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٦٢﴾ أَفَرَءَيْتُم مَّا تَحْرُثُونَ
﴿٦٣﴾ ءَأَنتُمْ تَزْرَعُونَهُۥٓ أَمْ نَحْنُ ٱلزَّٰرِعُونَ ﴿٦٤﴾ لَوْ نَشَآءُ لَجَعَلْنَٰهُ
حُطَٰمًا فَظَلْتُمْ تَفَكَّهُونَ ﴿٦٥﴾ إِنَّا لَمُغْرَمُونَ ﴿٦٦﴾ بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ
﴿٦٧﴾ أَفَرَءَيْتُمُ ٱلْمَآءَ ٱلَّذِى تَشْرَبُونَ ﴿٦٨﴾ ءَأَنتُمْ أَنزَلْتُمُوهُ مِنَ ٱلْمُزْنِ
أَمْ نَحْنُ ٱلْمُنزِلُونَ ﴿٦٩﴾ لَوْ نَشَآءُ جَعَلْنَٰهُ أُجَاجًا فَلَوْلَا تَشْكُرُونَ
﴿٧٠﴾ أَفَرَءَيْتُمُ ٱلنَّارَ ٱلَّتِى تُورُونَ ﴿٧١﴾ ءَأَنتُمْ أَنشَأْتُمْ شَجَرَتَهَآ أَمْ
نَحْنُ ٱلْمُنشِـُٔونَ ﴿٧٢﴾ نَحْنُ جَعَلْنَٰهَا تَذْكِرَةً وَمَتَٰعًا لِّلْمُقْوِينَ
﴿٧٣﴾ فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ ﴿٧٤﴾ ۞ فَلَآ أُقْسِمُ
بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ﴿٧٥﴾ وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٌ لَّوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ ﴿٧٦﴾

الحزب ٥٤

إِنَّهُۥ لَقُرْءَانٌ كَرِيمٌ ٥٣٦

بەتام و چێژى زۆر ناخۆشيشى نادەن ﴿٥٤ فشاربون عليه من
الحميم﴾ ئەوسا لەبەر تينويەتى لەئاوێكى زۆر گەرم بە
كوڵيشى بەسەرا دەكەن ﴿٥٥ فشاربون شرب الهيم﴾ جا
ئێوەش هەروەكو وشترى تينوو كە دەردى (هويام)ـى گرتبێ
و هيچ كات تێر ئاونەبێ دەخۆنەوەو تێر ئاويش نابن ﴿٥٦
هذا نزلهم يوم الدين﴾ ئەمەيە خۆراك و ئاوو ميواندارى
خوانەناسان لەرۆژى پاداشت.

### ئەمانە نيشانەى قيامەت و زيندووبوونەوەن:

﴿٥٧ نحن خلقناكم فلولا تصدقون﴾ ئێمە ئێوەمان
دروستكرد، ئيتر بۆچى باوەڕ بەزيندووبوونەوە ناكەن؟! ﴿٥٨
افرايتم ما تمنون﴾ ئايا نەتانديوە ئەوەى ئەيرێژنە ناو
منداڵدانى ژنان، پاشان منداڵى لىَپەيدا ئەبێ ﴿٥٩ ءانتم
تخلقونه أم نحن الخالقون﴾ ئايا ئێوە ئەو(مەنى)يە دروست
ئەكەن، يان ئێمە دروستى دەكەين؟! ديارە ئەڵێن تۆ
ئەىپەروەردگار! جاكەوابوو دانيش بەزيندووبوونەوەدا بنێن
﴿٦٠ نحن قدرنا بينكم الموت﴾ هەر ئێمەش لەنێوان ئێوەدا
بێجياوازيى لەنێوان دەوڵەمەندو هەژارو گەورەو بچووكدا
مەرگ ومردنمان داناوە ﴿وما نحن بمسبوقين﴾ وئێمە دەستەوسان كراو نين ﴿٦١ على ان نبدل أمثالكم﴾ لەسەرئەوە
كە شێوەو بيچمتان بگۆڕين بەشێوەو بيچمێ ﴿و ننشأكم فى ما لاتعلمون﴾ وە دروستتان بكەينەوە لەشێوەو
بيچمێكدا نازانن چيە ﴿٦٢ ولقد علمتم النشأة الأولى﴾ بێگومان لەدروستكردنى يەكەمجار ئاگادارن، كەلە چى
دروستمان كردوون ﴿فلولا تذكرون﴾ جا بۆچى رانامێنن بزانن كە من توانام هەيە دروستتان بكەمەوە؟.

### شين بوونى تۆمەو هاتنى ئاو لە هەورەوەو هەڵكردنى ئاگر نيشانەى بوونى خوان:

﴿٦٣ افرايتم ما تحرثون﴾ ئايا ديوتانە ئەوەى تۆوى دەيكێڵن؟ ﴿٦٤ ءانتم تزرعونه أم نحن الزارعون﴾ ئايا ئێوە
دەيروێنن وسەوزى ئەكەن؟ يان ئێمە دەيروێنين و سەوزى دەكەين؟ ديارە ئەڵێن خوا سەوزى ئەكات، جاكەوابوو
دانيش بەزيندووبوونەوەدا بنێن ﴿٦٥ لو نشاء لجعلناه حطاما﴾ خۆئەگەر بمانەوێ دەيكەينە پووش و پەڵاش

﴿فظلتم تفکهون﴾ ئەوسا ئیتر سەرتان سوڕ بمێنێ ﴿٦٦ إنا لمغرمون﴾ و بڵێن بەراستیی چاك زەرەرمەند بووین ﴿٦٧
بل نحن محرومون﴾ بەڵکو بێبەش کراو بووین ﴿٦٨ افرایتم الماء الذی تشربون﴾ ئەی سەرنجی ئەو ئاوەتان نەداوە
ئەیخۆنەوە ﴿٦٩ ءانتم انزلتموه من المزن﴾ ئایا ئێوە داتانبەزاندووە لەهەورەکان؟ ﴿أم نحن المنزلون﴾ یان ئێمە
دایدەبەزێنین؟ ﴿٧٠ لو نشاء جعلناه أجاجا﴾ ئەگەر بمانەوێ ئێوە سوود لەوئاوە وەرنەگرن دەیکەینە ئاوێکی سوێر
وتاڵ ﴿فلولا تشکرون﴾ دە ئایا سوپاسگوزاری ناکەن؟! ﴿٧١ افرایتم النار التی تورون﴾ ئایا سەرنجی ئەو ئاگرە
نادەن کە ئێوە هەڵی ئەگیرسێنن لەدارێکی تەڕوسوودی لێوەرئەگرن؟ ﴿٧٢ ءانتم انشأتم شجرتها﴾ ئایا ئێوە
دارەکەیتان دروست کردووە. نەوتیش-وەك زانیاری ئەڵێت- هەر لە ڕەگ وڕیشەی درەخت وبنکی گژ وگیاو.. هتد،
دێتە دەر ﴿أم نحن المنشئون﴾ یان ئێمەین دروستکەری؟
عەرەبەکان داری (مەرخ) یان بەداری (عفار) دا ئەهێناو
ئاگری ئەکردەوە، چونکە زانیاریی ئەو کاتە، تا ئەو پلە
گەیشتبوو، بەڵام ئێستاش مەسەلەی ئاگر باسێکی زۆر
گرنگە، ئایا چۆن و کێ لەسەرەتاوە ماددەی ئاگرەکەی
دروست کردووە.؟ دیارە هەرخوای گەورەو کارجوان ﴿٧٣
نحن جعلناها تذکرة﴾ بێگومان ئێمە ئەوئاگرەمان کردۆتە
هۆی یادەوەری بۆئاگرە گەورەکەی دۆزەخ ﴿ومتاعا
للمقوین﴾ و هەروەها کردومانەتە مایەی کەڵك و سوود
لێوەرگرتن بۆ ڕێبواران و خەڵکی بیابان، هەردوو ئیمامی
بوخاریی و موسلیم ئەم فەرموودە لەپێغەمبەرەوە ﷺ
ئەگێڕنەوە: ((إن نارکم هذه التی یوقد بنو آدم جزء من
سبعین جزءاً من نار جهنم، فقالوا یارسول الله: إن کانت
لکافیة، قال: فإنها فضلت علیها بتسعة وتسعین جزءا کلهن
مثل حرها)). لەم فەرمودەیشدا هاتووە: ((المسلمون شرکاء
فی ثلاثة: النار،والکلأ, والماء)).. رواه الإمام احمد ٥/٣٦٤
و أبوداود/ ٣/٢٧٧، وەبەم ریوایەتەش هاتووە: ((ثلاث
لایمنعن: الماء، والکلأ، والنار)) ابن ماجه: کتاب الرهن ٢/٨٢٨. ئاگر، گژو گیا، لەوەڕولەوەڕگە، ئاو، موسڵمانان -
بەتێکڕا- تیایاندا بەشدارن، نابێ هیچ کەسێکیانی لێ بێ بەش بکرێت کۆمەڵێك دایان بڕن بۆخۆیان. ﴿٧٤ فسبح
باسم ربك العظیم﴾ جا لەپاش بینینی ئەوهەمووشتە سەرسوڕهێنەرانە بەردەوام بە لەسەر تەسبیح بەیادی ناوی
خواوەندی مەزنت.

سُورَةُ الوَاقِعَة — الجزء السابع والعشرون

إِنَّهُۥ لَقُرۡءَانٞ كَرِيمٞ ﴿٧٧﴾ فِي كِتَٰبٖ مَّكۡنُونٖ ﴿٧٨﴾ لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلۡمُطَهَّرُونَ ﴿٧٩﴾ تَنزِيلٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٨٠﴾ أَفَبِهَٰذَا ٱلۡحَدِيثِ أَنتُم مُّدۡهِنُونَ ﴿٨١﴾ وَتَجۡعَلُونَ رِزۡقَكُمۡ أَنَّكُمۡ تُكَذِّبُونَ ﴿٨٢﴾ فَلَوۡلَآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلۡحُلۡقُومَ ﴿٨٣﴾ وَأَنتُمۡ حِينَئِذٖ تَنظُرُونَ ﴿٨٤﴾ وَنَحۡنُ أَقۡرَبُ إِلَيۡهِ مِنكُمۡ وَلَٰكِن لَّا تُبۡصِرُونَ ﴿٨٥﴾ فَلَوۡلَآ إِن كُنتُمۡ غَيۡرَ مَدِينِينَ ﴿٨٦﴾ تَرۡجِعُونَهَآ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٨٧﴾ فَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلۡمُقَرَّبِينَ ﴿٨٨﴾ فَرَوۡحٞ وَرَيۡحَانٞ وَجَنَّتُ نَعِيمٖ ﴿٨٩﴾ وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلۡيَمِينِ ﴿٩٠﴾ فَسَلَٰمٞ لَّكَ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلۡيَمِينِ ﴿٩١﴾ وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٩٢﴾ فَنُزُلٞ مِّنۡ حَمِيمٖ ﴿٩٣﴾ وَتَصۡلِيَةُ جَحِيمٍ ﴿٩٤﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ حَقُّ ٱلۡيَقِينِ ﴿٩٥﴾ فَسَبِّحۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٩٦﴾

سُورَةُ الحَدِيد — ٥٧ — آياتها ٢٩

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿١﴾ لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ يُحۡيِۦ وَيُمِيتُۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ﴿٢﴾ هُوَ ٱلۡأَوَّلُ وَٱلۡأٓخِرُ وَٱلظَّٰهِرُ وَٱلۡبَاطِنُۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٌ ﴿٣﴾

٥٣٧

### خوا لەسەر مەزنیی قورئان سوێند دەخوات:

﴿٧٥ فلا اقسم بمواقع النجوم﴾ سوێند بەجێ و شوێنی ئەستێرەکان ﴿٧٦ وإنه لقسم لو تعلمون عظیم﴾ وە
ئەوەش ئەگەر بزانن سوێندێکی گەورەیە، چونکە دەلالەتی تێدایە لەسەر قودرەتی خوا ﴿٧٧ إنه لقرآن کریم﴾
بەڕاستی ئەوەی وەحیت بۆ کراوە قورئانێکی بەفەڕە ﴿٧٨ فی کتاب مکنون﴾ لەنامەیەکی پارێزراودایە، واتە: (لوح

پارێزراودایه، واته: (لوح المحفوظ) ﴿٧٩ لا یمسه إلا المطهرون﴾ كەس دەستی لێنادات ,فریشتەكان نەبێت،،ئەم ئایەتە وەلامێكە بۆ ئەو بتپەرستانەی پێیان وابوو قورئان شەیاتین ئەیهێنێ بۆ پێغەمبەر نەك فریشتە (سەید قوتب) ئەڵێ: ئەم مانایە ئاشكراوڕوونترە بۆمانا دانەوەی (لایمسه إلا المطهرون) چونكە بیژەی (لا) بۆ (نەفی)یە, نەك بۆ (نەهی) ئەوەتا لە ڕووی زەویدا هەموو كەسێك دەستی تێوە ئەدات: چاك و خراپ، برواداروبێ بڕوا، ئەگەر نەهیبووبا دەبوو هیچ كەسێكیتر نەیتوانیبا دەستی تێوەبدات، ئایەتی (تنزیل من رب العالمین)یش پشتگیری ئەو مەبەستە ئەكات. ﴿٨٠ تنزیل من رب العالمین﴾ لەلایەن پەروەردگاری جیهانەكانەوە دابەزێنراوەتە خوارەوە. دەستەیەك لە زانایان وەك (عەلی كوری ئەبو تالیب و ئیبنی مەسعوود و سەعدو، كۆمەڵێكیش لە پێشەواكان (مالیك و شافیعی) پێیان وایە بێدەست نوێژ نابێ دەست بە قورئانەوە بدرێت، دەستەیەكی تریش وەك (ئیبن عەبباس و شەعبیو ئەبووحەنیفە)وهەندێكیتر لەزانایان دەڵێن: دەستدان بە قورئانەوە بێدەستنوێژ ڕەوایە. (ئیبن كەسیر)یش بۆ بەڵگەی ئەوە كە ڕەوا نیە بێدەست نوێژ دەست بدرێت بەقورئانەوە دووفەرموودەی هێناوە، بەلام دواتر ئەڵێ: (وفی اسناد كل منهما نظر، والله اعلم) واتە: لە سەنەدی هەردوو فەرمودەكاندا تێبینی هەیە!! ﴿٨١ افبهذا الحدیث انتم مدهنون﴾ ئایا ئێوە هەر بەم قورئانە باوەڕ ناكەن؟! ﴿٨٢ وتجعلون رزقكم انكم تكذبون﴾ وە ئێوە شوكرانەی ڕۆزیەكەتان دەگێڕن بەكوفرانی نیعمەت وئەڵێن بەهۆی فلانە ئەستێرەوە باران دەباری!

**گیان گەییە قوڕقوڕاگەو، بێ دەسەلاتی ئێوە بەڵگەی حساب كیشانتانە:**

﴿٨٣ فلولا إذا بلغت الحلقوم﴾ جا بۆ چ كاتێ گیانی یەكێكتان گەیشتە گەروو ﴿٨٤ وانتم حینئذ تنظرون﴾ و ئێوەیش لەو كاتەدا سەیری ئەكەن چۆن گیانی دەرئەچی؟! ﴿٨٥ ونحن اقرب إلیه منكم﴾ و ئێمە نزیكترین لێیەوە لە ئێوە،وەزاناترین بەحاڵی لە ئێوە ﴿ولكن لاتبصرون﴾ بەلام ئێوە فریشتەكان نابینن چۆن ئامادە بوون بۆ گیان كێشانیان، جا ئەگەر ئێوەن دروستكەر- وەك خۆتان نكوولی هەق ئەكەن- بۆچی گیانی ئەومردووە ناگێڕنەوە؟! ﴿٨٦ فلولا إن كنتم غیر مدینین﴾ دەبا ئەگەر پاداشتی كردەوەكانتان نادرێتەوە وەك ئێوە پێتان وایە! ﴿٨٧ ترجعونها إن كنتم صادقین﴾ گیانەكەی بۆدەگێڕنەوە ئەگەر ڕاست ئەكەن زیندووبوونەوە نیە و موحاسەبە ناكرێن، دیارە كەهەرگیز ئەودەسەلاتەتان نیە، جاچاك بزانن كە ئەبێ هەر خوا ئەوە بكات و بڕوایشی پێ بێنن.

**لەسەرەمەرگدا خەڵكی دەبنە سێ تاقم:**

﴿٨٨ فأما إن كان من المقربین﴾ ئینجا ئەگەر مردووەكە لە نزیكخراوەكان بێت ﴿٨٩ فروح و ریحان و جنة نعیم﴾ ئەوە ئیسراحەت و ڕزق و ڕۆزیەكی چاك و بەهەشتی بەرینی بۆهەیە ﴿٩٠ واما إن كان من اصحاب الیمین﴾ خۆئەگەر لەیارانی لای ڕاست بێت ﴿٩١ فسلام لك من اصحاب الیمین﴾ فریشتەكان پێیان ئەڵێن: لەلایەن یارانی لای ڕاستەوە سلاوت لێبێ ﴿٩٢ واما إن كان من المكذبین الضالین﴾ بەلام ئەگەر لەدەستەی بێ باوەڕان و گومڕایان بێ ﴿٩٣ فنزل من حمیم﴾ ئەوەمیوانداریی‌لەئاوێكی كوڵبەكوڵ ﴿٩٤ و تصلیة جحیم﴾ و خرانە نێو ئاگری بۆ هەیە ﴿٩٥ إن هذا لهو حق الیقین﴾ بێگومان ئەمەی بۆت باسكرا لەم سوورەتەدا ئەی موحەممەد! ﷺ سەبارەت بە هەرسێ دەستەكە, هەواڵێكی ڕاستی بێگومانە ﴿٩٦ فسبح

باسم ربك العظيم ﴾ جا كەوایە تەسبیح بكە بەیادی ناوی خوای مەزنت. بەڵێ كاتێ كە ئەم ئایەتە هات پەیامبەر ﷺ بەهاوەڵانی فەرموو: لە ركووعی نوێژەكاندا ئەم زیكرە بڵێن، كاتێكیش كە ئایەتی (سبح اسم ربك الأعلى) هات فەرمووی: ئەمەیش لەسوژدەدا بڵێن.

لە ٢٠ی شەعبانی (١٤١٧)ك بەرامبەر بە (١٩٩٦/١٢/٣٠) پاش نوێژی بەیانی، لە تەفسیری ئەم سوورەتە بوومەوە لە شاری (مەریوان). زۆر سوپاسی خوای خاوەن توانام ئەكەم.

*** *** ***

## ٥٧- سوورەتی ( حەدید )ـە

## مەدەنییەو ( ٢٩ ) ئایەتە



هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ
عَلَى ٱلۡعَرۡشِۚ يَعۡلَمُ مَا يَلِجُ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا يَخۡرُجُ مِنۡهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ
ٱلسَّمَآءِ وَمَا يَعۡرُجُ فِيهَاۖ وَهُوَ مَعَكُمۡ أَيۡنَ مَا كُنتُمۡۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ
بَصِيرٞ ٤ لَّهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ
٥ يُولِجُ ٱلَّيۡلَ فِي ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيۡلِۚ وَهُوَ عَلِيمُۢ بِذَاتِ
ٱلصُّدُورِ ٦ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَأَنفِقُواْ مِمَّا جَعَلَكُم
مُّسۡتَخۡلَفِينَ فِيهِۖ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَأَنفَقُواْ لَهُمۡ أَجۡرٞ كَبِيرٞ ٧
وَمَا لَكُمۡ لَا تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلرَّسُولُ يَدۡعُوكُمۡ لِتُؤۡمِنُواْ بِرَبِّكُمۡ وَقَدۡ
أَخَذَ مِيثَٰقَكُمۡ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ٨ هُوَ ٱلَّذِي يُنَزِّلُ عَلَىٰ عَبۡدِهِۦٓ
ءَايَٰتِۢ بَيِّنَٰتٖ لِّيُخۡرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ بِكُمۡ
لَرَءُوفٞ رَّحِيمٞ ٩ وَمَا لَكُمۡ أَلَّا تُنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلِلَّهِ مِيرَٰثُ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ لَا يَسۡتَوِي مِنكُم مَّنۡ أَنفَقَ مِن قَبۡلِ ٱلۡفَتۡحِ
وَقَٰتَلَۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَعۡظَمُ دَرَجَةٗ مِّنَ ٱلَّذِينَ أَنفَقُواْ مِنۢ بَعۡدُ وَقَٰتَلُواْۚ
وَكُلّٗا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ١٠ مَّن ذَا
ٱلَّذِي يُقۡرِضُ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗا فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥ وَلَهُۥٓ أَجۡرٞ كَرِيمٞ ١١



**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

ئەم سوورەتە بایەخ و گرنگی دەدات بەیاسای پەروەردەوپێگەیاندن و تێگەیاندن، هاوڕێ لەگەڵ بنیاتنانی كۆمەڵ و كۆمەڵگەیەكی ئیسلامیی بیروباوەڕ پاك وصاف وخاوەن رەوشتی بەرزو بڵند.

ئەم سوورەتە باسی سێ شتی بنەڕەتیی وسەرەكیی دەكات:

یەكەم: بوونەوەر هەموو دروستكراوی خوایە و هەمیشە لەژێر دەسەڵاتی ئەودایە. دووەم: هەرچی شتی بایەخدار هەیە، بەرۆح و گیانیشەوە دەبێ هەموو بكرێتە فیداو قوربانی ئایینی پیرۆزی خوا لەپێناوی بەرزكردنەوی منارەی ئیسلامدا.

سێ یەم: شوبهاندنی دونیا بەیاریی وگەمەی مندالان و گاڵتەوگەپەوە بۆئەوە كەهەرگیز مرۆڤی پێ نەخڵەتێ. ئەم سوورەتە پێی ئەڵێن سوورەتی (حدید=ئاسن!) چونكە باسی دروستكردن و ناردنی ئاسن دەكات،ئاسن مایەی هێزە بۆئادەمزاد، چ لەكاتی جەنگدا، چ لەكاتی ئاسوودەیی و ئاشتییدا، چونكە بە ئاسن زۆرشت دروست ئەكرێ.. لەگەڵ ئاماژە كردن بەوە كەئایینی پیرۆزی ئیسلام، بەڵكو هەمووحكومەت ودەوڵەتێك پێویستی بەهێزودەسەڵات هەیە بۆچەسپاندنی عەدالەت و دادگەریی ودانەواندنی ملی‌ملهوڕان بۆعەدالەت حوكمی خوا, لەفەزیلەت وگەورەیی ئەم سوورەتەیە كە(عیرباض/ خوا لێی رازیی بێ) دەڵێ: پێغەمەر ﷺ هەمیشە -پێش خەو- سوورەتە (سبح)ەكانی دەخوێندەوەو ئەیفەرموو: ((إن فيهن آية أفضل من ألف آية)) أخرجه أحمد: ١٢٨/٤. وابوداوود و الترمذی والنسائی. بەڕاستی ئەوسوورەتانە ئایەتێكیان تیدایە لەهەزار ئایەتی دی گەورەترە، ئەوئایەتەش: (هوالأول والآخر و الظاهر و الباطن وهو بكل شئ عليم)ە. هەروەها پێشەوا (ئەحمەد)یش ئەم فەرموودەیە دێنێ: ((اللهم رب السموات

السبع، ورب العرش العظيم، ربنا ورب كل شئ منزل التوراة والإنجيل والفرقان فالق الحب والنوى، لا إله إلا أنت، أعوذ بك من شر كل شئ أنت آخذ بناصيته)).

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم * ١ سبح لله مافى السموات والأرض﴾ ئەوەی لەئاسمانەكان و زەویدایە تەسبیحات بۆ خوا دەكا, ددان بە دەسەلاتی خواو بالادەستیی ئەودا دەنێن, بەلام ئێمە دەركی ناكەین و تێناگەین ﴿ وهو العزيز الحكيم﴾ هەرئەویشە دەستەلاتداری كارجوان وكارزان ﴿ له ملك السموات والأرض﴾ دەسەلات وپاشایەتی ئاسمانەكان و زەویی بۆئەوە, ئەوە بێ سنور ئالوگۆڕیان تیادەكات ﴿ يحيى ويميت﴾ دەژیێنێ و دەمرێنێ هەركات بیەوێ ﴿ وهوعلى كل شئ قدير﴾ ئەویشە دەسەلاتی بەسەر هەموو شتێكدا هەیە, بەرامبەر بەهیچ شتێك دەسەوسان ناوەستێ ﴿ هو الأول والآخر﴾ هەرئەویشە یەكەم كەهیچ شتێك لەپێشیەوە نیە، دواهەمینیش هەرئەوە كەهیچ لەدوایەوە نیە ﴿ والظاهر والباطن﴾ و بوونی ئاشكرا بەبەلگەكانی هەرئەوە ,واتە: لە ژوور ئەوەوە ئاشكراتر نیە, وەپەنهان بە هەقیقەت وكونهی لەدروستكراوەكانیئەوە كەلەو پەنهانتر نیە, لەفەرمودەیەكیشدا هاتووە: ((أنت الأول فليس قبلك شئ وأنت الآخر فليس بعدك شيء وأنت الظاهر فليس فوقك شئ، وأنت الباطن فليس دونك شئ، اقض عنا الدين، واغننا من الفقر)) أخرجه أحمد ومسلم ٢٠٨٤/٤ ﴿ وهو بكل شئ عليم﴾ هەر ئەویش زانایە بەهەمووشتێك (لە زەرەیەكەوە تاوردتر) ئاگاداریەتی.

**زانست و توانایی خوا گشتگیره:**

﴿ ٤ هو الذى خلق السموات والأرض فى ستة ايام﴾ هەرئەوخوایە ئاسمانەكان و زەویی لەماوەی شەش ڕۆژدا دروستكرد ﴿ ثم استوى على العرش﴾ پاشان چووە سەرعەرشی خۆی، بەچوونێك شایستەی زاتی خۆیبێت: (استواء يليق بجلاله من غير تمثيل ولا تكييف). خواش لە قورئاندا (٧)جار باسی (ئیستوا)ی خۆی بۆ چوونە سەر (عرش) كردووە، سوورەتی: (یونس:٣)، (ئەعراف:٥٤)، (رەعد:٢)،(طه:٥)،(فورقان:٥٩)،(سوجدە:٤)،(حە دید:٤)، جگە لەوەش كە لەسوورەتی (بەقەرە)دا (ثم استوى إلى السماء..) هاتووە.. لە بوخاریی وموسلیمیشدا چەندین فەرمووده هاتووە سەبارەت بەمانای بێژەی (عرش)، لەوانە:

١-((لما خلق الله الخلق كتب فى كتابه – وهو يكتب على نفسه– و هو وضع عنده على العرش: أن رحمتى تغلب غضبى)).

٢- ((عرشه على الماء بيده الأخرى الميزان يخفض و يرفع)).

٣- ((..كان الله ولم يكن شئ غيره، وكان عرشه على الماء)). زمانناسەكانیش دەلێن: هەركات بێژەی (على) بەدوای وشەی (استوا)دا هات، ئەوە تەنها مانای بەرزیی وبلندیی (العلو والإرتفاع) ئەبەخشێت. بەلێ.. دەبێ

موسلمان هەربەوجۆرە كەخوا خۆی باسیكردووە بڕوای بەسیفەتەكانی هەبێ، ئیتر بێ هیچ شوبهاندن و گۆڕین ودەستكاریی‌و لە كارخستنیان، هەربۆیە پێشەوا (مالیك) –خوا لیی ڕازی بێت– كاتێ لیی دەپرسن بۆمانای (استوى)، دەلێت: (الإستواء معلوم والكيف مجهول، والإيمان به واجب، والسؤال عنه بدعة. پێشەوا (ئەحمەد)یش –خوا لیی ڕازی بێت– دەلێت: (لا يوصف الله إلا بما وصف به نفسه أو وصفه به رسوله ﷺ، لا يتجاوز القرآن والحديث، وهذا هو مذهب السلف). جا كەوابوو هەرگیز ناگونجێ

ونارەوایە کەمانای سیفەتە جوانەکانی خوا تەفسیر بکرێنەوە، لەسەر ئەوبناغەیە نەبێت، کە خوا خۆی، یان پەیامبەرەکەی ﷺ راڤەیان کردبێت. (سەلەف)یش هەرئاوایان لێکردووە، بۆیە ئێمەیش دەڵێن: (نؤمن باستواء يليق بجلاله وعظمته من غير أن نمثل استواء كاستواء أحد من خلقه). جا بۆ زیادە ئاگاداریی لە (ئەسما) و (صفات) سەیرێکی کتێبی (لالەکایی) بەرگی ٤٢٩/٢. چاپی (١٩٩٧) بکرێ، لەگەڵ تەفسیری سوورەتی (ئەعراف). ﴿يعلم ما يلج في الأرض﴾ ئەزانێ چیدەچێت بەناوزەوییدا لە باران و جانەوەرو.. هتد ﴿وما يخرج منها﴾ چییشی لێدەر ئەچێ , لە رووەك و گژوگیاومیوەو..هتد, وەك ئەفەرمووێ: (..وما تسقط من ورقة إلا يعلمها ولا حبة في ظلمات الأرض ولا رطب ولا يابس إلا في كتاب مبين)(٥٩/٦). ﴿وما ينزل من السماء وما يعرج فيها﴾ چی لەئاسمان دێتە خوارێ و، چییش پێیدا سەرئەکەوێ , وەك فریشتەو کاروکردەوەکان ﴿وهو معكم أينما كنتم﴾ وەلەهەر جێگایەکیشدا بن ئەو (خوا)یەتان لەگەڵە. لەقورئان و فەرموودەدا گەلێ جارباسی "معیەت"ی خوای گەورە هاتووە، بەتایبەت ئیمامی (بوخاریی و ئیمامی موسلیم) زۆرێکیان لەو بابەتانە هێناوە بەپێویستی نازانم ئەگینا هەندێکیانم دەنووسی. سەلەف -خوا لێیان رازیی بێت- دەڵێن: خوا تێیگەیاندووین کەئەوخۆی لەسەر عەرشی خۆیەتیی وئاگایشی لەهەمووشتێکە و، ئێمە لەهەر جێگایەکدا ببین ئەومان لەگەڵدایە، واتە: زانیاریی وئاگاداریی تەواوی بەهەموان هەیە.بەڵێ (سەلەف) بەو جۆرەیە تەفسیری مانای (مەعیەت) دەکەنەوە، بێئەوەی کە تێکەڵی دروستکراوەکانی ببێ وبچێتە ناویانەوە!! بێگومان بیرکردنەوە لەمانای (معیەت) بەو شێوەیە کەگوایا تێکەڵ بەدروستکراوەکانی خۆی ببێ, لەخواوە زۆرزۆر دوورە، بۆیە ئێمەیش خۆی چی پێ مەبەستە بڕوامان پێیەتی. ﴿والله بما تعملون بصير﴾ وە خوا بە هەموو کارەکانتان بینایە ,هەر شتێك ئێوە ئەنجامی بدەن ئەو ئەیبینێ ﴿[5] له ملك السموات والأرض﴾ هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە هەرموڵکی ئەوە، وەك دەفەرمووێ: (وهو الله لا إله إلا هو له الحمد في الأولى والآخرة)(٧٠/٢٨). وە هەروەها دەفەرمووێ: (الحمد لله الذي له مافي السموات وما في الأرض وله الحمد في الآخرة وهو الحكيم الخبير) (١/٣٤).﴿وإلى الله ترجع الأمور﴾ وە ئەنجامی هەموو کاروبارێك، هەر بۆلای خودا دەگەڕێتەوە ﴿[6] يولج الليل في النهار ويولج النهار في الليل﴾ شەو دەکات بەناو رۆژداو رۆژدەکا بەناو شەودا, واتە:لە شەو دەخاتە سەر رۆژو لەرۆژیش دەخاتە سەر شەو,بەم شێوەیە کەم وزیاد لە سەاتەکانی شەوو رۆژدا دروست دەبێ.﴿وهو عليم بذات الصدور﴾ وە هەرئەویشە زاناو بەئاگا بەوەی کە لەدڵەکاندایە.

### ماڵتان لە رێی خوا بەخت بکەن:

﴿[7] آمنوا بالله ورسوله﴾ باوەڕ بەخواو بەپەیامبەرەکەیبکەن ﴿وأنفقوا مما جعلكم مستخلفين فيه﴾ وە لەوماڵ وسامانەی ئێوەی تیاکردوون بە جێنشین بەخت بکەن لە رێیجیهادو هەرکارێکی تری چاکدا ﴿فالذين آمنوا منكم وأنفقوا﴾ جا ئەوانەتان باوەڕیان هێناوەو لەماڵ و سامانیان بەخت کردووە ﴿لهم أجر كبير﴾ پاداشتێکی گەورەیان بۆ هەیە ﴿[8] ومالكم لا تؤمنون بالله﴾ ئەوە چیتانە بڕواناهێنن بەخوا؟!
﴿والرسول يدعوكم لتؤمنوا بربكم﴾ وەپەیامبەریش بانگتان ئەکات بۆ ئەوەیبڕوا بێنن بە پەروەردگارتان ﴿وقد أخذ ميثاقكم﴾ وبێگومان خواش پەیمانی لێ وەرگرتوون لە رێی ئەوهەموو بەڵگەو نیشانانەوە کە لە ئاسمانەکان وزەویدان ﴿إن كنتم مؤمنين﴾ ئەگەر ئێوە بڕوادارن بەوبەڵگەو نیشانانە، یان ئەگەر ئەتانەوێ

برِوادار بن، دەئەوە ئێستا کاتیەتی ﴿[٩] هو الذی ینزل علی عبده آیات بینات﴾ تەنیا ئەوخوایەیە ئایەتگەلێ مانارِوون دادەبەزێنێ بۆ بەندەی خۆی موحەممەد ﷺ ﴿لیخرجکم من الظلمات إلی النور﴾ تا لەتاریکییەکان دەرتان بێنێ بۆ رِووناکی ﴿وإن الله بکم لرؤوف رحیم﴾ بێگومان ئەوخوایە بەئێوە خوایەکی بە سۆزی میهرەبانە.

**بەختکردنی ماڵ بەرلە فەتحی مەککەو دوای فەتح، وەکو یەك نین:**

﴿[١٠] وما لکم الا تنفقوا فی سبیل الله﴾ وەئێوەچیتانە.! کە ماڵ وسامان بەخت ناکەن لەرِێی ئایینی خوادا؟! ﴿ولله میراث السموات والأرض﴾ خۆ هەرچی لەئاسمانەکان و زەویدایە هەربۆخوا دەمێنێتەوە بە میرات. واتە: ئێوە هەمووئەمرن و داراییەکەتان بەجێ ئەمێنێ و خوا دەبێتە خاوەنی،جا کەوایە ئێستا بۆنایبەخشن؟ ﴿لا یستوی منکم من أنفق من قبل الفتح وقاتل﴾ چوونیەك نین ئەوکەسەتان کەپێش (فتح) و(ئازادکردنی مەککە) ماڵ ودارایی خۆی بەخت کردووە و، لەگەڵ دوژمنانی خوادا جەنگاوە، لەگەڵ ئەوانەی تردا کەپاش فەتحی مەککە دێن وماڵ ودارایی خۆیان بەخت دەکەن ودەجەنگێن، چونکە پێش ئازادکردنی مەککە، زیاتر پێویستی بەبەخشینی ماڵ بوو ﴿أولئك أعظم درجة من الذین أنفقوا من بعد وقاتلوا﴾ ئا ئەوانە کەلەپێش فەتحی مەککەوە ماڵیان بەختکردووەو جەنگاون, پلەیان گەورەترە لەوانە کە لەپاش فەتحی مەککەوە ماڵیان بەختکردووەو جەنگاون. (واحیدی)ئەڵێ: ئەم ئایەتە لەشانی (ئەبوبەکر)دا (خوای لێ رازی بێت) هات، چونکە ئەویەکەم کەسێك بوو کەبرِوای هێناو ماڵ و سامانی خۆی بەختکردو پارێزگاری لەپەیامبەرﷺ کرد.

**سەرنجێك:** واحیدی ئەم باسە لە (کولەبی)یەوە ریوایەت دەکا، ئەم کولەبیشە متمانە پێکراو نیەو تۆمەتی زۆری لەسەرە، خاوەنی کتێبی (کشف الخفاء: ٢/٤٠٢). لە (مەیموون)ـەوە ئەڵێ: لەپێشەوا (ئەحمەد)م بیست گووتی: (ثلاثة کتب لیس لها أصل: المغازی، والملاحم، والتفاسیر). خەتیبی (بەغداد)یش ئەڵێ: (هذا محمول علی کتب مخصوصة فی‌هذه المعانی الثلاثة غیر معتمد علیها لعدم عدالة ناقلیها وزیادات القصاص فیها. فأما کتب الملاحم فجمیعها بهذه الصفة، ولیس یصح فی ذکر الملاحم المرتبقة والفتن المنتظرة غیر أحادیث یسیرة. وأما کتب التفاسیر: فمن أشهرها کتابا: الکلبی ومقاتل بن سلیمان، وقد قال الإمام أحمد فی تفسیر الکلبی: من أوله إلی آخره کذاب، قیل له فیحل النظر فیه؟ قال: لا، وکتاب مقاتل قریب منه). پەراوێزی تەفسیری قورتوبی چاپی (١٤١٥) ه (١٩٩٥)م. ﴿وکلا وعدالله الحسنی﴾ وە هەریەکێ لەوانەش ماڵیان بەخت کردووە وجەنگاون، بەپێی پلەی‌خۆیان خوای میهرەبان بەڵێنی بەهەشتی داونەتێ ﴿والله بما تعملون خبیر﴾ وە خوای هەق ئاگادارە بەکارەکانتان. پێشەوا (ئەحمەد) لە (ئەنەس)ەوە دەڵێ: (خالیدی کورِی وەلید) و(عبد الرحمن کورِی عەوف) چەند قسەیەك چووبەبەینیاندا! خالید بەعەبدول رەحمانی وت: چییە هەر لەبەرئەوە کەئێوە چەند رِۆژێ پێش ئێمە موسڵمان بوون هەرنای برِنەوە؟! پاشان ئەوکێشەیە گەیشتەوە پێغەمبەر ﷺ وفەرمووی: ((دعوا لی أصحابی، فوالذی نفسی بیده لوا أنفقتم مثل أحُد أو مثل الجبال ذهبا مابلغتم أعمالهم)) ئیمامی ئەحمەد ریوایەتی کردووە(٣/٢٦٦). وە هەروەها (ئەبی سەعیدی) خودریی دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((یوشك أن یأتی قوم تحقرون أعمالکم مع أعمالهم)). واتە:نزیکە خەڵکێ بێن ,کردەوەی ئێوە -ئەی هاوەڵان!- لەچاو هی‌خۆیان بەسووك وکەم دابنێن، سەعید

ئەڵێ: وتمان: جا ئەوانە چ کەسانێکن؟ قورەیشە؟ فەرمووی: ((لا، ولكن أهل اليمن لأنهم أرق أفئدة، وألين قلوبا)) نا، ئەوانە لەقورەیش نین، بەڵکو لە(یەمەنی)یەکانن، چونکە دڵ ودەروونی ئەمان زۆر نەرم ترە لەدڵ ودەروونی ئەوان. پاشان ئاماژەی بۆ(یەمەن) کردوو فەرمووی: ((هم أهل اليمن، الا إن الإيمان يمان، والحكمة يمانية)). ئیبن جەریر ریوایەتی کردووە، بۆ زیاترسود وەرگرتن لەبارەی دڵنەرمیی‌وئیمانی ئەهلی یەمەنەوە سەیری (صحيح مسلم) لە (باب تفاضل الإيمان) بەرگی یەك جوزئی دووبکە. ﴿١١ من ذا الذى يقرض الله قرضا حسنا﴾ هەرکەسێك قەرزی چاك وپاك بدات بەخوا ,واتە:ماڵ وسامانی خۆی بۆئەوبەخت بکات ﴿فيضاعفه له﴾ ئەواخواش چەند قات وچەند بەرامبەر بۆی قەرەبوودەکاتەوە ﴿وله اجر كريم﴾ و پاداشتێکی جوانی بۆ هەیە، ئەویش بەهەشتە. بەڵێ.. کاتێ ئەم ئایەتە هات (ئەبو دەحداح) وتی: ئەی پەیامبەری خوا ﷺ دەستت بێنە، ئەویش دەستیدایە، ئەوجا (ئەبو دەحداح) وتی: ئەوا ئەوباخەیەم کە (٦٠٠) شەش صەد بنە خورمایە بەقەرز بەخوامدا. ئینجا کاتێ گەڕایەوە ماڵ، بانگی خێزانەکەی کردو وتی: زووئێرە چۆڵ بکەن، چونکە داومە بەخوا بەقەرز. خێزانەکەیشی وتی: بەه، بەه، بەڕاستی کارێکی باشت کردووەو قازانجی چاکت کردووە.. ئیتردەست بەجێ ماڵ ومنداڵەکەی تیابردە دەرەوە" پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((رب نخلة مُدلاّة، عروقها دُرّ وياقوت، لأبى الدحداح فى الجنة))ئیبن کەسیر. اخرجه ابن أبى حاتم.

### موسڵمان بە نوری کردەوەی خۆی رێ دەردەکا:

﴿١٢ يوم ترى المؤمنين والمؤمنات﴾ رۆژی قیامەت پیاوان وژنانی بڕوادار دەبینی ﴿يسعى نورهم بين أيديهم وبأيمانهم﴾ ڕووناکیەکەیان لەبەردەم ولەلای راستیانەوە دەدرەوشێتەوە ﴿بشراكم اليوم﴾ فریشتە پێیان دەڵێت: دەسا ئەمڕۆ مژدەبێ لێتان ﴿جنات تجرى من تحتها الأنهار﴾ بەباخانێك جۆگەو رووبار بەژێردارو درەخت وکۆشکەکانیدا دەڕوات ﴿خالدين فيها﴾ بەهەتا هەتاییش تێیدا ئەمێننەوە ﴿ذلك هو الفوز العظيم﴾ ئائەوەیە سەر کەوتن وسەرفرازیی گەورە.

### دووڕازەکان لە موسڵمانان دەخوازن لایەکیان لێبکەنەوە:

﴿١٣ يوم يقول المنافقون والمنافقات﴾ لەو رۆژەدا پیاوانی دووڕوو و ژنانی دووڕوو دەڵێن: ﴿للذين آمنوا انظرونا نقتبس من نوركم﴾ بەوانەی باوەڕیان هێناوە دەڵێن: چاوەڕوانیمان بکەن با لە رووناکیەکەتان وەرگرین ﴿قيل ارجعوا وراءكم﴾ بە گاڵتەوە پێیان ئەوترێ: بگەڕێنەوە بۆ دواوەتان –بۆدونیا– ﴿فالتمسوا نورا﴾ لەوێ رووناکیەك بخوازن ﴿فضرب بينهم بسور له باب﴾ دەستبەجێ شوورەیەك دەخرێتە نێوان ئیمانداەکان و مونافیقەکان دەرگایەکی تیایە ﴿باطنه فيه الرحمة﴾ دیوی ناوەوەی رەحمەتی تێدایە، واتە: ئەوەی لە

---

الجزء السابع والعشرون — سورة الحديد

يَوْمَ تَرَى الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ يَسْعَىٰ نُورُهُم بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَانِهِم بُشْرَاكُمُ الْيَوْمَ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا ذَٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴿١٢﴾ يَوْمَ يَقُولُ الْمُنَافِقُونَ وَالْمُنَافِقَاتُ لِلَّذِينَ آمَنُوا انظُرُونَا نَقْتَبِسْ مِن نُّورِكُمْ قِيلَ ارْجِعُوا وَرَاءَكُمْ فَالْتَمِسُوا نُورًا فَضُرِبَ بَيْنَهُم بِسُورٍ لَّهُ بَابٌ بَاطِنُهُ فِيهِ الرَّحْمَةُ وَظَاهِرُهُ مِن قِبَلِهِ الْعَذَابُ ﴿١٣﴾ يُنَادُونَهُمْ أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ قَالُوا بَلَىٰ وَلَٰكِنَّكُمْ فَتَنتُمْ أَنفُسَكُمْ وَتَرَبَّصْتُمْ وَارْتَبْتُمْ وَغَرَّتْكُمُ الْأَمَانِيُّ حَتَّىٰ جَاءَ أَمْرُ اللَّهِ وَغَرَّكُم بِاللَّهِ الْغَرُورُ ﴿١٤﴾ فَالْيَوْمَ لَا يُؤْخَذُ مِنكُمْ فِدْيَةٌ وَلَا مِنَ الَّذِينَ كَفَرُوا مَأْوَاكُمُ النَّارُ هِيَ مَوْلَاكُمْ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ ﴿١٥﴾ ۞ أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ آمَنُوا أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ اللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ الْحَقِّ وَلَا يَكُونُوا كَالَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِن قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمُ الْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ ﴿١٦﴾ اعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ يُحْيِي الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ الْآيَاتِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿١٧﴾ إِنَّ الْمُصَّدِّقِينَ وَالْمُصَّدِّقَاتِ وَأَقْرَضُوا اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا يُضَاعَفُ لَهُمْ وَلَهُمْ أَجْرٌ كَرِيمٌ ﴿١٨﴾

٥٣٩

ئیماندارەکانەوە دیارە ﴿وظاهره من قبله العذاب﴾ لە دیوی دەرەوەشی سزایە، واتە: ئەوەی لە موونافقەکانەوە دیارە
﴿[١٤] ینادونهم ألم نكن معكم﴾ جا بەهەشتییەکان دەچنە جێی خۆیان و دووڕووەکانیش بانگیان لێئەکەن و ئەڵێن:
باشە ئێمە لەگەڵ ئێوە نەبووین؟ ﴿قالوا بلى ولكنكم فتنتم انفسكم﴾ موسڵمانەکان ئەڵێن: بەڵێ بەرەواڵەت لەگەڵمان
بوون، بەڵام ئێوە خۆتانتان تووشی دووڕوویی کرد ﴿وتربصتم﴾ چاوەڕوانیتان دەکرد تووشی بەڵا بین. لەسوورەتی
(تەوبە:٩٨)دا دەفەرموێ: (ويتربص بكم الدوائر) خۆتان مەڵاس دابوو کەزیان بەموسڵمانەکان بگەیەنن ﴿وارتبتم﴾
هەمیشە لەدوودڵیی و گوماندا دەژیان بەرامبەر بەئایینەکەی خوا ﴿و غرتكم الأماني﴾ و هیواو ئارەزووی نەشیاو
فریویدان ﴿حتى جاء امرالله﴾ تا فەرمانی خوا هات بەمردن ﴿و غركم بالله الغرور﴾ شەیتانی خراپکاریش سەبارەت
بەبڕیارەکانی خوا فریویدان ﴿[١٥] فاليوم لا يؤخذ منكم فدية ولا من الذين كفروا﴾ ئەمڕۆش فدیەیەك لە ئێوەو
لەوانەش بێبڕوا بوون وەرناگیرێ ﴿مأواكم النار﴾ جێگاو ماواتان ئاگری دۆزەخە ﴿هي مولاكم﴾ ئەو شایستەترە
پێتان ﴿وبئس المصير﴾ ئاگریش خراپ جێگای گەڕانەوەیە.

**کاتی ئەوە نەهاتووە کەدڵی موسڵمانان بۆ یادی خوا بکورکێنێ؟:**

﴿[١٦] الم يأن للذين آمنوا أن تخشع قلوبهم لذكر الله﴾ ئایا کاتی ئەوە نزیك نەبۆتەوە بۆئەوانەی بڕوایان هێناوەو
کە دڵەکانیان نەرم بێ بۆ یادی خوا ﴿وما نزل من الحق﴾ بۆئەوەی دابەزیوە لەقورئان؟ موسڵمانەکان کاتێ هاتنە
مەدینە ژیانێکی باش وخۆشیان دەسکەوت، بەهۆی ئەوەوە هەندێ سستی رووی تێکردن، ئەوجا خوای گەورە ئەو
گلەییەی لێمان کرا (٤) ساڵ بوو. (عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود) ئەڵێ: ماوەی موسڵمان بوونمان و ئەوگلەییەی
کەلێمان کرا چوار ساڵ بوو!موسلیم ٢٣١٩/٤. و نەسائیی ٤٨١/٦. ﴿ولا يكونوا كالذين أوتوا الكتاب من قبل﴾ وەك
ئەوانە نەبن کەلەپێش قورئانەوە کتێبیان پێدرابوو، لەجوولەکەو گاور ﴿فطال عليهم الأمد فقست قلوبهم﴾ زۆریان
بەسەرا تێپەڕی، ئەوسا دڵیان رەق بوو ﴿وكثير منهم فاسقون﴾ وە زۆربەشیان لە تاعەتی خوا دەرچوون ﴿[١٧] إعلموا
أن الله يحيي الأرض بعد موتها﴾ بزانن کەبێگومان هەرخوا زەویی زیندوو دەکاتەوە پاش مردنیی، واتە: پاش
وشکبوونی ﴿قد بينا لكم الآيات﴾ بێگومان نیشانەکانی دەسەڵاتی خۆمانمان بۆ روون کردنەوە ﴿لعلكم تعقلون﴾
بەشکو ژیریتان بەکاربێنن و تێبگەن چییان تێدایە، جا دڵەکانتان نەرم ببێ.

**پاداشی خێرۆمەندان و راستان و شەهیدان:**

﴿[١٨] إن المصدقين والمصدقات﴾ بێگومان ئەو پیاوو ژنە خێرخوازو سامان بەخشانە لەڕێی خوادا ﴿واقرضوا
الله قرضا حسنا﴾ ئەوانەش قەرزێکی چاکیان بەخوا دا ﴿يضاعف لهم﴾ ئەو قەرزەیان بۆچەند بەرانبەر ئەکرێتەوە
﴿ولهم اجر كريم﴾ و سەرەڕای ئەوەیش پاداشتێکی جوان و چاکیان بۆ هەیە، ئەویش بەهەشتە ﴿[١٩] و الذين آمنوا
بالله ورسله﴾ ئەو کەسانەش کەبڕوایان هێناوە بەخواو بەپەیامبەرانی ئەو ﴿أولئك هم الصديقون﴾ ئائەوانە، ئەوانەن
باوەڕیان بەپێغەمبەرەکان کردووە، لەبەرئەوە پلەی صدیقیەت و راستگۆییان وەرگرتووە. ((إن أهل الجنة ليتراءون
أهل الغرف من فوقهم، كما تتراءون الكوكب الدري الغابر في الأفق من المشرق أو المغرب لتفاضل ما بينهم، قالوا يا
رسول الله! تلك منازل الأنبياء لا يبلغها غيرهم! قال: بلى، والذي نفسي بيده! رجال آمنوا بالله وصدقوا المرسلين)).
رواه البخاري فتح: ٣٨٦/٦. موسلیم: ٢١٧٧/٤. واتە: بەڕاستیی بەهەشتیەکان خەڵکانی کۆشك و باڵەخانەی
بەهەشتیانی لای سەرووی خۆیان وەك ئەستێرەیەکی درەوشاوەی دوور لەئاسۆ لە خۆرهەڵات، یا خۆرئاوا دەبینن
(ئەوەندە جیاوازی پلەیان هەیە) وتیان: ئەی پێغەمبەر ﷺ جائەوە بارەگای پێغەمبەرانە، کێئەگاتە ئەوێ؟!

فەرمووی: سوێند بەوزاتەی کە گیانی منی بەدەستە! ئەوانە (پێغەمبەرنین) ئەوانە ئەوپیاوانەن کەبڕوایان بەخوا هێناوەو تەسدیقی پێغەمبەرانیان کردووە! بەڵێ ئەم بەرنامەو ئایینە پاسەوانی چاکی ئەوێ، هەرگیز بێ ئێشکچیی وپاسەوان راناوەستێ، وە لەم سەرزەوییەدا بێجیهاد گەشە ناکات، جیهاد بۆپاراستنی عەقیدەو بانگەوازو پاراستنی بانگەوازکەران لەئەزیەت وئەشکەنجەی دوژمنانە، وە بۆ گەیاندنی بانگەوازی یەکخواپەرستییە بەهەموو دنیا ﴿والشهداء عندربهم لهم اجرهم ونورهم﴾ شەهیدانیش پاداشت و رووناکی خۆیان هەیە ﴿و الذین کفروا وکذبوا بآیاتنا﴾ ئەوانەش کە بێبڕوا بوون و ئایەتەکانی ئێمەیان بەدرۆ دەکرد ﴿ولئك اصحاب الجحیم﴾ ئا ئەوانەن هاوەڵەکانی ئاگری دۆزەخ.

**ژیانی ئەم دنیایە هەرگەمەو بادی هەوایە:**

﴿[٢٠] اعلموا انما الحیاة الدنیا﴾ بزانن کەبەڕاستی ژیانی ئەم دونیایە ﴿لعب و لهو وزینة وتفاخر بینکم وتکاثر فی الأموال والأولاد﴾ تەنها گەمەو گەپ و جوانیی‌و زۆرکردنی ماڵ و مناڵ و خۆهەڵکێشانی نێوانتانە ﴿کمثل الغیث اعجب الکفار نباته﴾ وەك وێنەی بارانێکە شینایییەکەی کشتیاران سەرسام بکات ﴿ثم یهیج فتراه مصفرا﴾ پاشان وشك ببێ ,جابیبینیبەزەرد بوویی ﴿ثم یکون حطاما﴾ دواتر وردو خاشاك ببێ و (با) هەرپرووشەی بباتە جێگاکەوە، واتە: زیباو جوانی ئەم دونیایەش هەروەك مەزراو کشتوکاڵێك وایە کە زۆربەجوانیی وڕێك وپێکی بنج داکوتێ، سەوز ببێ، پاشان وشك و زەرد وەرگەڕێ وبایەکی توندی بۆهەڵکەوێ هەرپرووشەی بخاتە بن دارێك ﴿وفی الآخرة عذاب شدید﴾ لەپاشەڕۆژیشدا سزایەکی سەخت هەیە بۆکافرو بێباوەڕان ﴿ومغفرة من الله ورضوان﴾ لێبوردن و رەزامەندییکیش لاوخوا هەیە بۆ دۆستانی ﴿وما الحیاة الدنیا إلا متاع الغرور﴾ ژیانی دونیا تەنها کاڵای دەستخەڕۆکارە ,کەوابوو هۆشیار بن و نەخەڵەتێن بە دونیا ﴿[٢١] سابقوا إلی مغفرة من ربکم﴾ ئەی خەڵکینە! پێشبڕکێ بکەن بۆ هۆیەکانی لێبوردن لەپەروەردگارتانەوە بە تەوبەو کردەوەی چاك ﴿و جنة عرضها کعرض السماء والأرض﴾ وە بۆگەیشتن بەبەهەشتێك کەپانایی و فراوانییەکەی, وەك پانتایی ئاسمان و زەویە، وەك لەسوورەتی تردا ئەفەرموێ: (.. وجنة عرضها السموات والأرض أعدت للمتقین)(١٣٣/٣). جا ئەگەر سەرنجێکی وردی زانیارییانە بدرێت لەفراوان بوونی بوونەوەر – بەتایبەت ئەمڕۆ– ئەوا هەموو مرۆڤێك مل رائەکێشێ بۆئەم راستییەو، هیچ سەرلێکردنەوەیەکی ناوێ ﴿أعدت للذین آمنوا بالله ورسله﴾ ئامادەکراوە بۆ ئەوکەسانەی بڕوایان هێناوە بەخواو بەپەیامبەرانی ﴿ذلك فضل الله یؤتیه من یشاء﴾ ئەوەش فەزڵی خوایە، دەیدات بەهەرکەسێ خۆی بیەوێ وشایستە بێت ﴿والله ذو الفضل العظیم﴾وەخوا خاوەنی فەزڵ وبەخششی گەورەیە.

سُورَةُ الحَدِيدِ الجزء السابع والعشرون

وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦٓ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصِّدِّيقُونَ وَٱلشُّهَدَآءُ
عِندَ رَبِّهِمْ لَهُمْ أَجْرُهُمْ وَنُورُهُمْ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ
بِـَٔايَٰتِنَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَحِيمِ ﴿١٩﴾ ٱعْلَمُوٓاْ أَنَّمَا ٱلْحَيَوٰةُ
ٱلدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ وَزِينَةٌ وَتَفَاخُرٌۢ بَيْنَكُمْ وَتَكَاثُرٌ فِى ٱلْأَمْوَٰلِ
وَٱلْأَوْلَٰدِ كَمَثَلِ غَيْثٍ أَعْجَبَ ٱلْكُفَّارَ نَبَاتُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ
مُصْفَرًّا ثُمَّ يَكُونُ حُطَٰمًا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَمَغْفِرَةٌ
مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنٌ وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلْغُرُورِ ﴿٢٠﴾
سَابِقُوٓاْ إِلَىٰ مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا كَعَرْضِ ٱلسَّمَآءِ
وَٱلْأَرْضِ أُعِدَّتْ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ ذَٰلِكَ فَضْلُ
ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٢١﴾ مَآ أَصَابَ
مِن مُّصِيبَةٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فِىٓ أَنفُسِكُمْ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ
مِّن قَبْلِ أَن نَّبْرَأَهَآ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ﴿٢٢﴾ لِّكَيْلَا
تَأْسَوْاْ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ وَلَا تَفْرَحُواْ بِمَآ ءَاتَىٰكُمْ وَٱللَّهُ
لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ﴿٢٣﴾ ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ وَيَأْمُرُونَ
ٱلنَّاسَ بِٱلْبُخْلِ وَمَن يَتَوَلَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿٢٤﴾

لَقَدْ أَرْسَلْنَا ٥٤٠

**هەرچیتان تووش ئەبێ بەرلەوە نووسراوە:**

﴿ [٢٢] ما أصاب من مصيبة فى الأرض ولاق انفسكم﴾ هیچ بەڵاو نەهامەتیەکتان تووشتان نابێت نە لەزەویدا – وەك وقات و قڕیی.. هتد –وەنە لەخۆشتاندا –وەك نەخۆشیی ومردن– ﴿ إلا فى كتاب من قبل أن نبراها﴾ مەگەر پێش ئەوە بەدی بێنین لە (لوح المحفوظ)دا تۆمار کراوە، واتە: هەرچی ڕووبداوپێش بێت، ئێمە پێش ئەوە تۆمارمانکردووەوئاگادارین لێی. (عەبدوڵلای کوڕی عومەر) دەڵێ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((قدّر الله المقادير قبل أن يخلق السموات والأرض بخمسين ألف سنة))موسلیم. ٢٠٤٤/٤، ئەحمەد: ١٦٩/٢، ترمزیی: ٣٧٠/٦. خوا پەنجاهەزار ساڵ بەرلەوە کەئاسمانەکان و زەوی بەدی بێنێ هەموو ڕووداوو بڕیارێکی خۆی تۆمار کردووە و نووسیوە ﴿ إن ذلك على الله يسير﴾ بەڕاستی ئەوەش بۆخوا شتێکی ئاسانە ﴿ [٢٣] لكيلا تأسوا على ما فاتكم﴾ ئەمەش بۆئەوەی خەفەت نەخۆن بۆئەوەی لەدەستتان چووە. واتە: کاتێ زانیتان کەهەموو شتێ هەر بەبڕیاری خوایە, ئیتر دڵتان دائەمرکێتەوە. ﴿ ولا تفرحوا بما آتاكم﴾ وە بەوەش غەڕرامەبن پێمان بەخشیون، واتە: ڕژدیی وچرووکیی تیامەکەن، و لەخۆبایی مەبن، چونکە هەموو شتێك بە دەستی خۆمانە، گومانیش نیە کەئەگەر مرۆڤ خۆی نەبەستێت بەدەسەڵاتی پەروەردگاریەوە بەرگەی هیچ شتێك ناگرێ، بۆیە ئەبێ لەهەموو قۆناغەکانی ژیانیدا دڵی خۆی ببەستێ بەزاتی خواوە ﴿ والله لا يحب كل مختال فخور﴾ وە خوا کەسانی لە خۆبایی بووو خۆهەڵکێشێ خۆش ناوێ ﴿ [٢٤] الذين يبخلون ويأمرون الناس بالبخل﴾ ئەوانەی خۆیان ڕژدیی و چرووکی ئەکەن و سەرەڕای ئەوەش، فەرمان بە خەڵکی دەکەن ﴿ ومن يتول فإن الله هو الغنى الحميد﴾ وە هەرکەسێك پشت هەڵبکات لەسامان بەختکردن, ئەوە بێگومان خوا بێنیازە لەوخەڵکەو لەماڵ بەختکردنەکەی, وە بۆخۆی هەمیشە سوپاسکراویشە, لەجێگەیەکی تردا ئەفەرمووێ: (إن تكفروا أنتم ومن فى الأرض جميعا فإن الله لغنى حميد).

**بە عەدل و بە ئاسن، وڵات سەقامگیر دەبێ:**

﴿ [٢٥] لقد ارسلنا رسلنا بالبينات﴾ سوێند ئەخۆم بێگومان پەیامبەرەکانمان بەچەندینیشانەوموعجیزەی ڕوونەوە ڕەوانەکرد ﴿ وانزلنا معهم الكتاب والميزان﴾ وە لەگەڵیاندا نامەو ترازووی دادمان نارد ﴿ ليقوم الناس بالقسط﴾ بۆ ئەوەی خەڵکی بەعەدالەت و دادگەریی هەڵسن ومامەڵە بکەن لەگەڵ یەکتری ﴿ وانزلنا الحديد فيه بأس شديد﴾ ئاسنیشمان دروستکرد کە زەبرێکی توندی تیایە بۆ جەنگ وکوشتارپێکردن لە حاڵەتی جەنگدا, وە بۆپاراستنی وڵات و نیشتمان و پیادەکردنی عەدل وعەدالەت و چەسپاندنی حەق و ڕاستیی، چونکە زۆرینەی هۆجەنگیەکان، هەر لەمادەی ئاسن دروست ئەکرێ ﴿ ومنافع للناس﴾ جگە لەوەیش گەلێسوودیشی تێدایە بۆخەڵك لەکاتیئاسایش و ئاشتیدا بۆ بیناسازیی و پیشەسازیی وکشت وکاڵ و..هتد.بەکورتیی: زۆربەی پێداویستیەکان پێویستیان بەئاسن هەیە ﴿ ليعلم الله من ينصره ورسله بالغيب﴾ تا لەجیهانی واقیعیشدا خوا بزانێ و ببینێ کێ ئایینی خواوپەیامبەرەکانی سەردەخات بەبەکار هێنانی ئاسن لەجیهادی دوژمناندا لە حاڵی غەیبدا ﴿ إن الله قوى عزيز﴾ بە ڕاستیی خوا, خوایەکی بەهێزی دەسەڵاتدارە، ویستی لەهەرکەسێك بێ سەری دەخات. (ئیبن کەسیر) ئەڵێت: خوا مادەی ئاسنی کردووە بەتەمێکاری ئەوانەی لەهەق و ڕاستیەکان نکووڵی ئەکەن پاش ئەوەی کەلەلایەن پێغەمبەرانەوە تێگەیەنران و، ملیان ڕانەکێشا.. هەر بۆیەش پەیامبەری ئازیزمان (موحەممەد ﷺ) سیازدە ساڵ لەمەککەدا هەوڵیدا بۆ تێگەیاندنی کۆمەڵ، جاپاش ئەوە کەبەتەواوی تێیگەیاندن و کەڵکیان لێ وەرنەگرت، ئیتر بەناچاری فەرمانی کۆچ دراو، پاشان جیهاد کردن لەگەڵیاندا بەهەموو جۆرە چەکێکی ئەوسەردەمە. پێغەمبەری

خوا ﷺ دەفەرموێ: ((بعثت بالسيف بين يدى الساعة حتى يعبد الله وحده لاشريك له، وجعل رزقى تحت ظل رمحى، وجعل الذلة والصغار على من خالف أمرى، ومن شبه بقوم فهو منهم)) ئەحمەد: ٥٠/٢. ئەبوداود: ٣١٤/٤. واتە: لەنزیکی ئاخرزەمانەوە منی بە(شیر)ەوە نارد بۆ ئەوەی کەهەرخوا بپەرستریت، وەرزق وروزی خستە ژێرسێبەری رمەکەمەوە،وە سووکیی و ریسواییشی بڕیاردا بۆکەسانێ لەفەرمانی من سەرپیچی بکەن، وەهەرکەسێکیش خۆی بەقەوم و کۆمەڵێك بچوێنێ ئەوە لەوانە.

**ئوممەتانی پێشوو لادەریان زۆر بوو:**

﴿[٢٦] ولقد أرسلنا نوحا وإبراهيم﴾ بەڕاستی نوح وئیبراهیممان نارد بۆلای هۆزەکانیان ﴿وجعلنا فی ذریتهما النبوة والکتاب﴾ و پێغەمبەرێتیی و کتێبمان دا بەنەوەکانیان ﴿فمنهم مهتد﴾ جا هەندێکیان رێنما بوون ﴿و کثیر منهم فاسقون﴾ و زۆرێکیشیان لە رێگەی راست دەرچوون ﴿[٢٧] ثم قفینا علی آثارهم برسلنا﴾ پاشان پێغەمبەرەکانمان هێنا بەشوێنیاندا، واتە: پەیامبەردوای پەیامبەریان بۆ نێررا: موسا، ئیلیاس، داود، سولەیمان..هتد ﴿وقفینا بعیسی ابن مریم﴾ وە عیسای کوڕی مەریەمیشمان هێنا بە شوێن ئەواندا ﴿وآتیناه الإنجیل﴾ وئینجیلیشمان پێدا کەموژدەی بەهاتنی پێغەمبەر ﷺ ئەدا ﴿وجعلنا فی قلوب الذین اتبعوه رافة ورحمة﴾ سۆزو بەزەییەکمان خستە نێو دڵی ئەوانەوە کەشوێنی دەکەوتن ﴿ورهبانیة ابتدعوها﴾ گۆشەگیریی و رەبەنییان داهێناو کردیانە پیشەیان ﴿ما کتبناها علیهم﴾ ئێمەش پێویستمان نەکردبوو لەسەریان کەتەرکی دونیا بکەن بەڵکو هەندێ قەشەو گۆشە نشینەکانیان هەڵیان بژارد بۆ خۆیان، پێغەمبەرمان محەممەد ﷺ فەرموویەتی: ((لکل نبي رهبانية، ورهبانية هذه الأمة الجهاد في سبيل الله))أخرجه احمد: ٢٦٦/٣. واتە: هەر پێغەمبەرەی رەهبانیەتێکی بۆخۆی بووە، رەهبانیەتی ئەم ئوممەتەیش – ئوممەتی ئیسلام– جیهادکردنە لەرێی خوادا. ﴿إلا ابتغاء رضوان الله﴾ بەڵام دایان هێنا بە مەبەستی رەزامەندی خوا ﴿فما رعوها حق رعایتها﴾ کەچی پارێزگاری و ریعایەتیان نەکرد، واتە: دوو جار تووشی هەڵەبوون، جارێکیان بێئەوەی خوا مۆڵەتی دابێ گۆشەگیریان بۆخۆیان داهێنا، جارێکی تریش هەرچیەکیان وت راستیان نەکرد لەگەڵ خۆیاندا. جا بەم ئایەتە روون بوویەوە کەخوای گەورە گۆشەگیریی و رەبەنی فەرز نەکردبوو لەسەریان، بەڵام گاورەکان خۆیان بەنیازی رەزامەندی خوا دایان هێنابوو، کەچی نەشیان توانی بەباشی ئاگاداری بکەن و بیپارێزن، ئەوەبوو بەرواڵەت داوای تەقواو صەلاحەتیان ئەکرد، بەڵام لەژێرەوە دەستیان کرد بەحەرام خواردن و دەست درێژیی بۆسەر یەکترا! ﴿فآتینا الذین آمنوا منهم اجرهم﴾ ئینجا ئێمەش پاداشی ئەوانەیانمان دایەوە کەبڕوایان

الجزء السابع والعشرون — سُورَةُ الحَدِيدِ

لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَٰبَ
وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ وَأَنزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ
بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥ وَرُسُلَهُۥ
بِالْغَيْبِ إِنَّ اللَّهَ قَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴿٢٥﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا وَإِبْرَٰهِيمَ
وَجَعَلْنَا فِى ذُرِّيَّتِهِمَا النُّبُوَّةَ وَالْكِتَٰبَ فَمِنْهُم مُّهْتَدٍ
وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ ﴿٢٦﴾ ثُمَّ قَفَّيْنَا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم
بِرُسُلِنَا وَقَفَّيْنَا بِعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ وَءَاتَيْنَٰهُ الْإِنجِيلَ
وَجَعَلْنَا فِى قُلُوبِ الَّذِينَ اتَّبَعُوهُ رَأْفَةً وَرَحْمَةً وَرَهْبَانِيَّةً
ابْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَٰهَا عَلَيْهِمْ إِلَّا ابْتِغَآءَ رِضْوَٰنِ اللَّهِ فَمَا
رَعَوْهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا فَـَٔاتَيْنَا الَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنْهُمْ أَجْرَهُمْ
وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ ﴿٢٧﴾ يَٰٓأَيُّهَا الَّذِينَ ءَامَنُوا۟ اتَّقُوا۟ اللَّهَ
وَءَامِنُوا۟ بِرَسُولِهِۦ يُؤْتِكُمْ كِفْلَيْنِ مِن رَّحْمَتِهِۦ وَيَجْعَل لَّكُمْ
نُورًا تَمْشُونَ بِهِۦ وَيَغْفِرْ لَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٨﴾ لِّئَلَّا يَعْلَمَ
أَهْلُ الْكِتَٰبِ أَلَّا يَقْدِرُونَ عَلَىٰ شَىْءٍ مِّن فَضْلِ اللَّهِ وَأَنَّ
الْفَضْلَ بِيَدِ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ ﴿٢٩﴾

٥٤١

بەموحەممەدﷺ هێنا ﴿و كثير منهم فاسقون﴾ و زۆربەشیان لەفەرمان و تاعەتی خوا دەرچوون ﴿[٢٨] يا أيها الذين آمنوا اتقوا الله﴾ ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە بە موساوعیسا پارێز لە قەدەغەكراوەكانی خوا بكەن ﴿و آمنوا برسوله﴾ وە بڕوا بێنن بەپەیامبەرەكەی موحەممەدﷺ ﴿يؤتكم كفلين من رحمته﴾ ئەوسا دووپاداشتان ئەداتەوە لە بەزەیی خۆی. (ئەبوموسای ئەشعەریی) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ثلاثة يؤتون أجرهم مرتين: رجل من أهل الكتاب آمن بنبيه وآمن بی فله أجران، وعبد مملوك أدى حق الله وحق مواليه فله أجران، ورجل أدب أمته فأحسن تأديبه ثم أعتقها وتزوجها فه أجران)) أخرجه البخاري: فتح الباري: ٢٢٩/١. ومسليم: ١٣٤/١. واتە: سێ كەس پاداشیان دووبەرامبەر دەبێت: پیاوێ لەخاوەن نامەكان كەبڕوای بەپێغەمبەرەكەی خۆی هێنابێ و بڕوا بەمنیش بێنێت، وە بەندەیەكیش مافی خواو، مافی گەورەو ئاغاكەی خۆی جێبەجێ بكا، وە پیاوێكیش بەڕێك وپێكی ئەدەب و وێڵی كەنیزەكەی بدا، پاشان ئازادی بكاو بیهێنێ ﴿و يجعل لكم نورا تمشون به﴾ نورێكتان بداتێ كەڕێی پێبكەن ﴿ويغفر لكم﴾ لە گوناهەكانیشتان ببورێ ﴿والله غفور رحيم﴾ و ئەو خوایە خوایەكی زۆر لێبوردەی میهرەبانە ﴿[٢٩] لئلا يعلم أهل الكتاب الا يقدرون على شئ من فضل الله﴾ تا خاوەن نامەكان -ئەوانەیان ئیمانیان نەهێنا- بزانن كەهیچ شتێكیان لە فەزڵ و چاكەی خوا بەدەست نیە. واتە: ناتوانن پەیامبەریەتی دابڕن هەر بۆخۆیان و وا بزانن پەیامبەر هەرئەبێ لەوان بێت! ﴿وان الفضل بيد الله يؤتيه من يشاء﴾ و تا بزانن كە پەیامبەرێتی كە - گەورەترینی فەزڵە- بەدەستی خوایە دەیدات بە هەركەسێ خۆی بیەوێ ﴿والله ذو الفضل العظيم﴾ بێگومان خوا خاوەن چاكەو فەزڵی گەورەیە، جا كەوابوو پێشبڕكێ بكەن بۆ بەهەشت و مل رابكێشن بۆ فەرمانەكانی خواو بیشزانن كەخوا ئارەزووی خۆیەتی كێ ئەباتە بەهەشتەوەو، كێیشی لێ بێبەش ئەكات.

لە (٢٤)ی شەعبانی (١٤١٧)ك بەرامبەر بە (١٩٩٧/١/٣) پاش نوێژی بەیانیی، كاتژمێر (٧:٠٠) لەنووسینی تەفسیری ئەم سوورەتە بوومەوە لەهەڵەبجەی زامدار لە (راگەیاندنی بزووتنەوە).

كۆتایی جزمی بیست و حەوت

و لله الحمد و المنة.

*** *** ****

## ٥٨- سوورەتی (موجادلە)یە

### مەدەنییەو (٢٢) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتە لە پاش سوورەتی (مونافیقون)ـەوە هاتووە، باسی چەند بنەماو حوكمێكی ئیسلام دەكات، سەبارەت بە (ظیهار)و ئەو تۆڵەو بریتیەی دەكەوێتە سەر (ظیهار)كار. شێوەو ئادابی دانیشتن لەناویەكتردا. هەر كەسێك بیەوێت بڕواتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، پێویستە پێش ئەوەی بچێت، خێرو (صەدەقەیەك) بدات بەهەژاران. خۆش نەویستنی دوژمنانی دینی خوا.. هەروەها باسێكی دوو ڕووڕازەكان لەگەڵ باسێكی جوولەكەكاندا، بۆ یەكەمجار رووداوو داستانەكەی خاتوو (خەولە) دەگێڕێتەوەو ئینجا حوكمی (ظیهار) پاشان باسی چپەو سرتەی دوو كەس لەتەك یەكتردا، یان زیاتر لە دووكەس دەكا..هتد. جابەم شێوەیەش دەست پێدەكات: ﴿بسم الله الرحمن الرحيم * [١] قد سمع الله قول التى تجادلك فى زوجها﴾ بێگومان خوا قسەی ئەو ژنەیە بیست گفت و گۆی لەگەڵ تۆكرد (ئەی موحەممەد!ﷺ) لەبارەی مێردەكەیەوە ﴿وتشتكى إلى الله﴾ و سكاڵای بۆلای خوا ئەبرد بۆ چارەسەر

﴿والله يسمع تحاوركما﴾ لەکاتێکدا خواش گوێی لەگفتوگۆکەی هەردووکتانە وە بوو. ڕۆژێك (ئەوسی کوری سامیت) رکی لە خاتوو (خەولە)ی هاوسەری هەڵسا وتی: تۆ لەجێگەی دایکمی، پاشان (خەولە) ڕۆیشت بۆلای پەیامبەر ﷺ و ڕووداوەکەی بۆگێڕایەوە، ئەویش فەرمووی لێیحەرام بوویت ونابێ بگەڕێیتەوە لای. (خەولە)ش وتی: سوێند بە خوا تەلاق بە دەمیا نەهاتووەو باوکی منداڵانمەو خۆش ئەوێ، پەیامبەریش ﷺ وەڵامی هەر ئەوەبوو بۆی، ئیتر خەولەش هەر ئەڕۆیشت و ئەهات و بە خەفەتەوە ئە تلایەوە و ڕووی دەکردە خواو هاناو سکاڵای خۆی بۆخوا دەبرد، دەرەنجام خوای میهرەبانیش بۆ وەڵامەکەی چوار ئایەتی ئەوەڵی ئەم سوورەتەی ناردە خوارەوە. پێشەوا ئەحمەد. ٦/٤١٠ ﴿إن الله سميع بصير﴾ بەراستیی خوا خوایەکیبیسەری ئەو پاڕانەوەو وتوو وێژەی ئەوانە، بە کردو کرداریشیان بینایە.

سُورَةُ المُجَادَلَة — الجزء الثامن والعشرون

سُورَةُ المُجَادَلَةِ — ترتيبها ٥٨ — آياتها ٢٢

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِي تُجَٰدِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِيٓ إِلَى ٱللَّهِ
وَٱللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَآۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٌ ﴿١﴾ ٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ
مِنكُم مِّن نِّسَآئِهِم مَّا هُنَّ أُمَّهَٰتِهِمْۖ إِنْ أُمَّهَٰتُهُمْ إِلَّا ٱلَّٰٓـِٔي
وَلَدْنَهُمْۚ وَإِنَّهُمْ لَيَقُولُونَ مُنكَرًا مِّنَ ٱلْقَوْلِ وَزُورًاۚ وَإِنَّ
ٱللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ ﴿٢﴾ وَٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ
لِمَا قَالُواْ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِّن قَبْلِ أَن يَتَمَآسَّاۚ ذَٰلِكُمْ تُوعَظُونَ
بِهِۦۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٣﴾ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ
مُتَتَابِعَيْنِ مِن قَبْلِ أَن يَتَمَآسَّاۖ فَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ فَإِطْعَامُ سِتِّينَ
مِسْكِينًاۚ ذَٰلِكَ لِتُؤْمِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۚ وَتِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِۗ
وَلِلْكَٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٤﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحَآدُّونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ كُبِتُواْ
كَمَا كُبِتَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْۚ وَقَدْ أَنزَلْنَآ ءَايَٰتِۭ بَيِّنَٰتٍۚ وَلِلْكَٰفِرِينَ
عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿٥﴾ يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُهُم بِمَا
عَمِلُوٓاْۚ أَحْصَىٰهُ ٱللَّهُ وَنَسُوهُۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ ﴿٦﴾

أَلَمْ تَرَ أَنَّ — ٥٤٢

**(ظیهار) و بارتەقاکەی:**

﴿[٢] الذين يظاهرون منكم من نسائهم﴾ ئەوانەتان لە ژنەکانتان (ظهار) ئەکەن و پێیان ئەڵێن: ئێوە لەجێی دایکمانن، یان وەك پشتی دایکمانن ﴿ماهن امهاتهم﴾ ئەوانە دایکیان نین ﴿إن امهاتهم إلا اللائی ولدنهم﴾ دایکیان هەر ئەو ژنانەن ئەوانیان لێبووە ﴿وانهم ليقولون منكرا من القول وزورا﴾ وە بەڕاستیی ئەوانە قسەیەکی ناپەسەندو درۆیەکی نابەجێ دەکەن ﴿وإن الله لعفو غفور﴾ وە بەراستی خوا خوایەکی بەخشەری گوناهپۆشە. بەڵێ.. لەپێش ئیسلامدا کەسێك بە ژنەکەی وتبا: تۆ بۆ من وەك دایکمی, بە عەرەبی: (أنتِ كظهر أمی) ئیتر بەهەتاهەتایی لێی یاساغ ئەبوو، جا کاتێ ئیسلام هات ئەو ڕەفتارەی هەڵوەشاندەوەو بە تەڵاقی دانەناو، بڕیار یشیدا کە ئەگەر ئەو پیاوە بیەوێ ئەو ژنە بکاتەوە بە ژنی خۆی ولەگەڵیا بژی، ئەبێ کە فارەت بدات، بەو شێوەیە کە لەئایەتی دواییدا روون کراوەتەوە. ئینجا باسی کەفارەتی ئەو وشەیەدەکا کە دەڵێ تۆ لەجێی دایکمی، یان تۆ بۆمن وەك پشتی دایکمی ﴿[٣] والذين يظاهرون من نسائهم﴾ ئەوانەی لە ژنەکانیان (ظیهار)ئەکەن ﴿ثم يعودون لما قالوا﴾ لەپاشان دەگەڕێنەوەو پەشیمان دەبنەوە لە قسەی خۆیان و ئەیانەوێ بیانکەنەوە بە ژنی خۆیان، ئەوە دەبێ پێش ئەوە یەکێ لەم سێشتە بکەن:﴿فتحرير رقبة من قبل أن يتماسا﴾ یەکەم: پێش ئەوە بگەنە یەك و تێکەڵیی ژن ومێردی بکەن، بەندەیەك ئازاد بکەن , واتە: ئەگەر (ظیهار)کار ویستی هاوسەرەکەی بکاتەوە بەژنی خۆی، ئەوە نابێ نزیکی بکەوێتەوە تا کەفارەت ئەدا ﴿ذلكم توعظون به﴾ ئەوی خوا واجبی کردە سەرتان لە ئازادکردنی بەندە ئامۆژگارییەکە بۆتان, ئامۆژگاریتان پێ دەکرێ, تا جارێکی تر ئەو وتانە بەدەمتانا نەیەن ﴿والله بما تعملون خبير﴾ خواش ئاگادارە بەوکارو کردەوانە ئێوە دەیکەن ﴿[٤] فمن لم يجد فصيام شهرين متتابعين﴾ دووەم: ئەوکەسەی کۆیلەی نەبووئازادی بکات، یان پارەی نەبوو پێی بکڕێت ,ئەوە ئەبێ دوو مانگ لەسەر یەك

بەرۆژوو بێت. ڕاڤەکارانی قورئان ئەڵێن: ئەگەر بێ بڕوو بیانووی شەرعیی مۆڵەتی بەخۆی داو رۆژێکی لێنەگرت، ئەبێ بگەڕێتەوە بۆ سەرەتای مانگەکە ﴿من قبل ان يتماسا﴾ بەر لەوە بەیەك بگەن وتێکەڵ بېن ﴿فمن لم يستطع فإطعام ستين مسكينا﴾ سێیەم: جائەوەی نەیتوانی دوومانگەکە بەڕۆژوو بێت (لەبەر پیری، یان لە بەرنەخۆشیی) با شەست هەژار لە ژەمێك خواردن تێربکات، واتە: بەهەر کەسێکیان (٦٠٠) غم، گەنم، یان جۆ، یاخورما، یان برنج بدا، یان نرخەکەیان، ئەو جانزیك بکەوێتەوە ﴿ذلك لتؤمنوا بالله ورسوله﴾ ئەو کەفارەتەش بۆ ئەوەیە کە باوەڕتان بتەو بێت بەخواو بە پەیامبەرەکەی ئەو، واتە: خۆتان ببەستن بەبەرنامەکەی خواوەو، جارێکی تر ئەو قسانە نەکەن ﴿وتلك حدود الله﴾ ئەمانەش سنوورو فەرمانی خوان , تێنەپەڕن بەسەریاندا ﴿وللكفرين عذاب اليم﴾ بۆ ئەو بێ باوەڕانەش نکوولی ئەو حوکمانە دەکەن سزایەکی بە ئێش هەیە.

الجزء الثامن والعشرون — سورة المجادلة

أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ مَا يَكُونُ
مِن نَّجْوَىٰ ثَلَٰثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ
وَلَآ أَدْنَىٰ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ أَيْنَ مَا كَانُوا۟ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم
بِمَا عَمِلُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ٧ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ
نُهُوا۟ عَنِ ٱلنَّجْوَىٰ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا نُهُوا۟ عَنْهُ وَيَتَنَٰجَوْنَ بِٱلْإِثْمِ
وَٱلْعُدْوَٰنِ وَمَعْصِيَتِ ٱلرَّسُولِ وَإِذَا جَآءُوكَ حَيَّوْكَ بِمَا لَمْ يُحَيِّكَ
بِهِ ٱللَّهُ وَيَقُولُونَ فِىٓ أَنفُسِهِمْ لَوْلَا يُعَذِّبُنَا ٱللَّهُ بِمَا نَقُولُ حَسْبُهُمْ
جَهَنَّمُ يَصْلَوْنَهَا فَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ٨ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا
تَنَٰجَيْتُمْ فَلَا تَتَنَٰجَوْا۟ بِٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَمَعْصِيَتِ ٱلرَّسُولِ وَتَنَٰجَوْا۟
بِٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِىٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ٩ إِنَّمَا ٱلنَّجْوَىٰ
مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ لِيَحْزُنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَلَيْسَ بِضَآرِّهِمْ شَيْـًٔا
إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ١٠ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُوٓا۟ إِذَا قِيلَ لَكُمْ تَفَسَّحُوا۟ فِى ٱلْمَجَٰلِسِ فَٱفْسَحُوا۟ يَفْسَحِ
ٱللَّهُ لَكُمْ وَإِذَا قِيلَ ٱنشُزُوا۟ فَٱنشُزُوا۟ يَرْفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟
مِنكُمْ وَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ دَرَجَٰتٍ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ١١

٥٤٣

### خەڵکانی دژ بەخواو بە پێغەمبەر دوچاردەبن:

٥ ﴿إن الذين يحادون الله ورسوله﴾ بێگومان ئەوانەی دژایەتی خواو پەیامبەرەکەی ئەکەن ﴿كبتوا كما كبت الذين من قبلهم﴾ ڕیسوا دەکرێن وەك ئەوانەی پێشیان ڕیسواکران ﴿وقد انزلنا آيات بينات﴾ وە بەهەقیقەت ئێمە ئایەتگەلێ روون و ئاشکرامان دابەزاندۆتە خوارەوە کە هەموو ڕاستیەکیان تیا روونکراوەتەوە، مەگەر خوانەناس نکوولی بکات ﴿وللكافرين عذاب مهين﴾ وە بۆ ئەوکافرو بێباوەڕانەش نکوولییان دەکەن, سزایەکی تەزێنەر هەیەو.

### خوا ئاگای لە وردو درشتی کاری مرۆڤە:

٦ ﴿يوم يبعثهم الله جميعا﴾ ڕۆژێك خوا پێشینان وپاشینان,هەموو زیندوو دەکاتەوە ﴿فينبئهم بماعملوا﴾ ئینجا بە هەمووئەو کاروکردەوانە کردوویانن ئاگاداریان دەکات ﴿احصاه الله ونسوه﴾ خوا ئاماریکردووەو نووسیویەتی لەسەریان. ئەوان لەبیریان چوّتەوە ﴿والله على كل شئ شهيد﴾ وە خوا شایەدە لەسەر هەموو شتێك , واتە:هیچ شتێکی لێ بزر نابێ ٧ ﴿الم تر ان الله يعلم ما فى السموات وما فى الأرض﴾ ئایا نەتزانیوە کە خوا دەزانێ چی لەئاسمانەکان و زەویدایە؟﴿مايكون من نجوى ثلاثة إلا هو رابعهم﴾ هەر سێ کەسێك لەگەڵ یەکتردا چپە بکەن خوا چوارەمینیانە ﴿ولا خمسة إلا هو سادسهم﴾ وە هەر پێنج کەسێك چپە بکەن, خوا شەشەمیانە ﴿ولا ادنى من ذلك ولا اكثر﴾ وە لەو ژمارانەش کەمتر، یا زۆرتر ﴿إلا هومعهم أينما كانوا﴾ لە هەر کوێدابن هەر خوایان لە گەڵە, واتە: ئەوانە هەر چەندبن، هەرچی بکەن، هەرچی بڵێن، لە هەر شوێنێکدا بن، خوا لەگەڵیانە وئاگای لە هەموو شتێکیانە. جا بۆماناو مەبەست لە رستەی (لەگەڵدابوون) سەیرێکی ئایەتی چوارەمی سوورەتی (حەدید)بکە ﴿ثم ينبئهم بما عملوا يوم القيامة﴾ پاشان لەرۆژی قیامەتدا زۆر

بەوردی هەواڵی هەموو ئەوکارو کردەوانەیان پێدەدا ﴿إن الله بكل شئ عليم﴾ بەڕاستی خوا بەهەموو شتێك زاناو ئاگایە.

## جوولەکەو ئاژاوە گێڕییان:

جوولەکەو دووڕووەکان هەمیشە لەناو خۆیاندا چپە چپیان بوو,وە بە جۆرێ دەیان ڕوانیە موسڵمانەکانیان وەك بڵێی شتێك ڕوویدابێ، جا ئەمانیش ئەوەیان پێی ناخۆش بوو، بۆیە هاناو سکاڵایان بۆ پەیامبەر ﷺ برد، پاشان وەك (ئیبن عەبباس) ئەڵێ ئەم ئایەتە هات وفەرمووی: ﴿ [٨] الم تر إلى الذين نهوا عن النجوى﴾ ئایا سەرنجت بەلای ئەوانەدا نەداوە لە چپەو سرتە - لەرووی موسڵمانەکاندا -قەدەغە کراون ﴿ثم يعودون لما نهوا عنه﴾ پاشان هەمیسان دەگەڕێنەوە بۆئەو کارەی لێیان یاساغکرابوو؟ ﴿ويتناجون بالإثم والعدوان ومعصية الرسول﴾ وەلەناو یەکتردا بەردەوام بەکاری تاوان و خراپەو دوژمنایەتی و, نا فەرمانی پەیامبەر ﷺ، چپە و سرتە سرت دەکەن ﴿وإذا جاؤوك حيوك بما لم يحيك به الله﴾ وەکاتێکیش بێن بۆ لات،بە جۆرێ سڵاوت لێ دەکەن کە خوا بەوجۆرە سڵاوی لێنەکردوویت.

(خاتوو عائیشە/ سڵاوی لە سەر بێ) ئەڵێ: کەدەهاتن لەباتی ئەوە کە بڵێن: السلام عليك)، ئەیانوت: السام عليك) واتە: یاخوا بمریت ﴿ويقولون في انفسهم لولا يعذبنا الله بما نقول﴾ وە لەنێو خۆیاندا -بەگاڵتەوە - ئەڵێن: دەبۆ خوا بەو قسانە بەرامبەر بە پێغەمبەر دەیانکەین, جەزرەبەو سزامان نادات؟ ﴿حسبهم جهنم يصلونها﴾ دۆزەخیان بەسە, دەچنە ناویەوە (گەرماو نارەحەتیەکەی دەچێژن) ﴿فبئس المصير﴾ جا دۆزەخیش جێگاو سەرەنجامێکی خراپە.

## چپەو سرتە تەنیا بۆ ئەنجامدانی کاری چاك ڕێی پێدراوە:

﴿ [٩] ياايهاالذين آمنوا إذا تناجيتم﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! کاتێ قسەی پەنامەکی و چپە لە نیوان خۆتاندا دەکەن ﴿فلا تتناجوا بالإثم والعدوان ومعصية الرسول﴾ جا ئێوە بە تاوان و دوژمنایەتی و نافەرمانی پەیامبەر ﷺ قسەی بە دزی مەکەن، واتە: ئێوە وەك جوولەکەو دوو ڕووەکان مەکەن ﴿وتناجوا بالبر والتقوى﴾ وەبەوەسیەتکردن بە چاکەو تەقوا قسەی بەدزی و چپە بکەن ﴿واتقوا الله الذي إليه تحشرون﴾ لەوخوایە بترسن هەمووتان لای ئەو کۆئەکرێنەوەو حیساب دەکرێن و پاداش و تۆڵە وەردەگرنەوە ﴿ [١٠] إنما النجوى من الشيطان﴾ بەڕاستی چپە چپ بەتاوان ودوژمنکاری و سەر پێچی پێغەمبەر لە شەیتانەوەیە ﴿ليحزن الذين آمنوا﴾ تا ئەوانە باوەڕیان هێناوە،دڵیان تەنگ بکات ﴿وليس بضارهم شيئا إلاّ بإذن الله﴾ و بە فەرمانی خوا نەبێ هیچ جۆرە زیانێکیان لێنادا سرتە سرتیان ﴿وعلى الله فليتوكل المؤمنون﴾ وەدەبا باوەڕدارەکان تەنیا پشت بەخوا ببەستن ومتمانەیان بەو ببێ و، لەچپەو سرتەو خەیانەتی ئەوان نەترسن، هەروەها گەلێ فەرموودەش بۆ ڕێگرتن لەچپەچپ، بەمەبەستی ئێش و ئازاردانی دڵی موسڵمانان هاتووە، وەك ئەفەرمووێ: ((إذا كنتم ثلاثة فلا يتناجى إثنان دون الثالث إلا بإذنه فإن ذلك يحزنه)) بوخاریی، وە موسلیم/١٧١٧/٤ ریوایەتیان کردووە. واتە: کەئێوە سێکەسبن , هەرگیز دوانتان بێئەوی دیکەتان سرتەسرت مەکەن، مەگەر بەڕەزامەندی ئەوبێت،چونکە ئەوکەسە بەوە دڵگران دەبێ.

**ڕەوشی کۆڕو مەزنیی زانست:**

﴿[11] یاأیهاالذین آمنوا إذا قیل لکم تفسحوا فی المجالس﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە!کاتێ لەدانیشتن و کۆبوونەوەکانتاندا پێتان وترا:جێگابۆ کەسانی تر فراوان بکەن ﴿فافسحوا﴾ دەسا ئێوەش بەخێرایی فراوانی بکەن و جێو ڕێ بۆهاوڕێکانتان بکەنەوەو، جم وجوڵێ بکەن بائەوانیش جێیان ببێتەوە ودانیشن ﴿یفسح الله لکم﴾ خوایش بۆتان گوشاد ئەکا وپاداشی فراوانیشتان دەداتێ. موسڵمانانی پێشوو وەك (قەتادە)و(موجاهید) ئەڵێن: پێشبڕکێیان دەکرد بۆدانیشتن لەکۆڕەکانی پەیامبەردا ﷺ، جا بۆ فراوان بوونی دانیشتنەکە ,خوا داوایان لێ ئەکات کە جێی یەکتر بکەنەوە با هاوڕێکانیشیان جێیان بێتەوە و دانیشن. تەبەریی:٢٣/٢٤٤. ((لا یقیمن أحدکم رجلا من مجلسه ثم یجلس فیه، ولکن توسعوا تفسحوا یفسح الله لکم)) بوخاریی و موسلیم ریوایەتیان کردووە. واتە: نابێ هیچ کەسێ لەجێی خۆی هەڵسێنن و خۆتان لەجێگاکەیدا دانیشن، بەڵام بۆ ئەوە کەجێی بێتەوە کۆڕەکە فراوان و گوشاد بکەن وجێی ئەوانیش بکەنەوە، ئەوجا خوایش کار ئاسانیتان بۆ دەکات و پاداشتان فراوان دەکات ﴿وإذا قیل انشزوا فانشزوا﴾ وەکاتێ پێتان وترا: لە جێی خۆتان هەستن، بۆگەورەو پیاوانی ریش سپی و بەتەمەنەکانتان, ئێوەش بەپەلە هەستن. زانای پایەبەرز (ئیبن کەسیر) لە تەفسیرەکەیدا ئەڵێت: دەربارەی هەستان لەبەر یەکتر و جێگا چۆڵکردن بۆیەکتر. زاناکان بوونەتە چەند دەستەیەکەوە: هەندێ دەڵێ: هەستان لەبەریەکتر ڕەوایە ئەم فەرموودەیە: ((قوموا إلى سیدکم)) واتە: لەبەرگەورە وفەرماندەکەتان (سەعد) هەڵسن و ڕێزی بگرن. زانای واش هەیە: ڕێ بەهەستان لەبەر یەکتر، بەبەڵگەی ئەم فەرموودەیە: ((من أحب أن یتمثل له الناس قیاما فلیتبوأ مقعده من النار)). واتە: ئەو کەسەی حەز بکا خەڵکی لەبەر دەستیا بەپێوە راوەستن، باجێ وشوێن بۆ خۆی لەئاگردا ساز بدات, هەندێکیشیان درێژە بە باسەکە ئەدەن و ئەڵێن: ئەگەر کەسێك لەسەفەر بگەڕێتەوە، وەیان لەجێیەکدا کارمەندی دەوڵەتی ئیسلامیی بێت –وەك داستانەکەی سەعدی کوڕی مەعاز– کە پەیامبەر ﷺ ناردی بە دوایا تاسەبارەت بەکێشەکەی (بەنی قورەیزە) بیکا بەحەکەم، جا کە هات و گەیشتە لای پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((قوموا إلى سیدکم)) پاشان (ئیبن کەسیر) دەڵێت:بەپێوە وەستان کاروپیشەی عەجەمەکانە! واتە: ئێوە مەیکەنە پیشە ﴿یرفع الله الذین آمنوا منکم والذین أوتوا العلم درجات﴾ خوائەو کەسانەتان باوەڕیان هێناوە بەرز دەکاتەوە,وئەوانەش زانستیان پێدراوە پلەگەلێ بەسەرباوەڕدارەکاندا بەرز دەکاتەوە,چونکە ڕێزو شەرەفمەندی لای خوا تەنها بەباوەڕو زانستەوەیە ﴿والله بما تعملون خبیر﴾ خواش بەئاگایە بەو کاروکردەوانە ئێوەدەیکەن، کەوابوو هەوڵی کردەوەی باش بدەن.

**بەرلەوە چپەلە گەڵ پێغەمبەر بکەن, خێرێ بکەن:**

﴿[12] یا أیها الذین آمنوا إذا ناجیتم الرسول فقدموا بین یدی نجواکم صدقة﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! کاتێ ویستتان چپەیەك و، قسەیەکی نهێنی لەگەڵ پەیامبەردا ﷺ بکەن , دەبێ پێش ئەوچپەیەتان صەدەقەیەك و خێرێك بکەن، ئەمە دانانی ڕێزو قەدرو حورمەتە بۆ پەیامبەر ﷺ و ڕێز لێگرتنیەتی بۆئەوە هەموو کەسێك خۆی نەکات بەماڵی پەیامبەرداو کاتی زۆری لێ بگرێ. بەڵێ دەبێ موسڵمانانیش ریعایەتی ئیش وکاری یەکتر بکەن و رێگە نەدەن کات لەیەکتری بگرن ﴿ذلك خیر لکم واطهر﴾ ئەو خێرو صەدەقەیە چاکترەو پاکترە بۆتان ﴿فإن لم تجدوا فإن الله غفور رحیم﴾ خۆ ئەگەر شتێکتان دەست نەکەوت بیکەنە صەدەقە، بەراستیی خوا خوایەکی گوناهپۆشیمیهرەبانە، مۆڵەتتان ئەدات بچنە لای پەیامبەر ﷺ ئەگەرچی شتێکیش نەبێ پێش خۆتانی بخەن ﴿[13] أأشفقتم أن تقدموا بین یدی نجواکم صدقات﴾ ئایا ترسان لە هەژاری کە صەدەقەکان پێشکەش بکەن لە پێش

چپەکردنەکەتان؟ واتە: مەترسن، خوا خاوەنی هەموو شتێکە، ئێوە کاری خۆتان بکەن و خوا دەوڵەمەندە ﴿فإذ لم تفعلوا وتاب الله عليكم﴾ ئینجا کەواشتان نەکرد,واتە: صەدەقەیەکیان پێش نەخست,خواش تەوبەی لێ‌وەرگرتن ﴿فأقيموا الصلاة وآتوا الزكاة﴾ ئەوسائیتر نوێژەکانتان بەچاکی بەجێ بێنن و زەکاتیش بدەن ﴿واطيعوا الله ورسوله﴾ و گوێڕایەڵی خواو پەیامبەرەکەی بکەن ﴿والله خبير بما تعملون﴾ خواش زۆر بەئاگایە بەوەی ئێوە ئەیکەن.ڕاڤەکارانی قورئان ئەڵێن: لەبەردلۆڤانی و میهرەبانی خوا بەرامبەر بە بەندەکانی خۆی, ئەو خێرو صەدەقەیەی بۆ سووککردن. (ئیبن عەبباس) ئەڵێ: ئەو فەرمان بەسەدەقەیە تەنها ڕۆژێك بوو، پاشان خوای میهرەبان باری موسڵمانانی سووککردوسڕییەوە.

### ئەنجامی دووڕوو و غەزەب لێگیراوەکان:



يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا نَٰجَيْتُمُ ٱلرَّسُولَ فَقَدِّمُوا۟ بَيْنَ يَدَىْ نَجْوَىٰكُمْ
صَدَقَةً ذَٰلِكَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَأَطْهَرُ فَإِن لَّمْ تَجِدُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ
(١٢) ءَأَشْفَقْتُمْ أَن تُقَدِّمُوا۟ بَيْنَ يَدَىْ نَجْوَىٰكُمْ صَدَقَٰتٍ فَإِذْ لَمْ تَفْعَلُوا۟
وَتَابَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمْ فَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ
وَرَسُولَهُۥ وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ (١٣) ۞ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ تَوَلَّوْا۟ قَوْمًا
غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مَّا هُم مِّنكُمْ وَلَا مِنْهُمْ وَيَحْلِفُونَ عَلَى ٱلْكَذِبِ
وَهُمْ يَعْلَمُونَ (١٤) أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا إِنَّهُمْ سَآءَ مَا كَانُوا۟
يَعْمَلُونَ (١٥) ٱتَّخَذُوٓا۟ أَيْمَٰنَهُمْ جُنَّةً فَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ فَلَهُمْ
عَذَابٌ مُّهِينٌ (١٦) لَّن تُغْنِىَ عَنْهُمْ أَمْوَٰلُهُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُهُم مِّنَ ٱللَّهِ
شَيْـًٔا أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ (١٧) يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ
ٱللَّهُ جَمِيعًا فَيَحْلِفُونَ لَهُۥ كَمَا يَحْلِفُونَ لَكُمْ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ عَلَىٰ شَىْءٍ أَلَآ
إِنَّهُمْ هُمُ ٱلْكَٰذِبُونَ (١٨) ٱسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمُ ٱلشَّيْطَٰنُ فَأَنسَىٰهُمْ ذِكْرَ
ٱللَّهِ أُو۟لَٰٓئِكَ حِزْبُ ٱلشَّيْطَٰنِ أَلَآ إِنَّ حِزْبَ ٱلشَّيْطَٰنِ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ
(١٩) إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحَآدُّونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ أُو۟لَٰٓئِكَ فِى ٱلْأَذَلِّينَ (٢٠)
كَتَبَ ٱللَّهُ لَأَغْلِبَنَّ أَنَا۠ وَرُسُلِىٓ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِىٌّ عَزِيزٌ (٢١)



﴿[١٤] ألم تر إلى الذين تولوا قوما غضب الله عليهم﴾ ئایا سەیری ئەوانەت نەکرد دۆستایەتی نەتەوەیەکیان کردکەخوا غەزەبی لێگرتوون,واتە: لە حاڵەتی ئاواداجێگەی سەرسوڕمانە کە دووڕووەکان ئیدیعای باوەڕ ئەکەن! کەچی لەو لاشەوە دۆستایەتی جوولەکە ئەکەن! ﴿ما هم منكم ولا منهم﴾ ئەو دووڕووانە نە لەئێوەن، نەلە وانیشن، بەڵکو خەڵکێکی بێ‌بارن و، قسەی ئێوە دەبەن بۆئەوان! ﴿ويحلفون على الكذب وهم يعلمون﴾ سوێندیش لەسەر درۆ ئەخۆن وخۆشیان ئەزانن درۆزنن ﴿[١٥] اعد الله لهم عذابا شديدا﴾ خوا سزایەکی توندوسەختی بۆ ئامادەکردوون ﴿إنهم ساء ماكانوا يعملون﴾ بەڕاستی ئەوەی ئەیانکرد کاری‌خراپ بوو ﴿[١٦] اتخذوا ايمانهم جنة فصدوا عن سبيل الله﴾ سوێندەکانیان کردبوو بە سوپەر بۆ پاراستنی خۆیان لە شمشێری موسڵمانەکان, بەوەش پێشگیری خەڵکیان کردبوو لە ڕێگەی خوا, واتە: لە ئیسلام ﴿فلهم عهذاب مهين﴾ جا سزایەکی ریسواکەریان بۆ هەیە ﴿[١٧] لن تغنى عنهم اموالهم ولا اولادهم من الله شيئا﴾ هەرگیز ماڵ ومنداڵیان هیچك بێ نیازیان ناکا لە سزای خوا لەپاشە ڕۆژدا, ئەگەرچی خۆیان دەڵێن بەماڵ و منداڵ خۆ دەپارێزین ﴿اولئك اصحاب النار هم فيها خالدون﴾ ئائەوانە هاوەڵی‌ئاگری دۆزەخن , بەهەتاهەتاییش تێیدا ئەمێننەوە ﴿[١٨] يوم يبعثهم الله جميعا﴾ ڕۆژێك خوا هەموویان زیندوو ئەکاتەوە ﴿فيحلفون له كما يحلفون لكم﴾ ئەوسا سوێن دەخۆن بۆ خوا کە ئەهلی ئیمان بوون، وەك ئێستا سوێند بۆ ئێوە دەخۆن ارد ﴿ويحسبون انهم على شئ﴾ واش دەزانن شتێك لە باریاندایە بەوسوێندە ﴿الا إنهم هم الكاذبون﴾ هۆشیار بن! کە بەراستیی‌ئەوانن درۆزنەکان ﴿[١٩] إستحوذ عليهم الشيطان﴾ شەیتان زاڵ بووە بە سەریاندا بەوەسوەسە ودەغدەغە و لەخشتەی بردوون ﴿فأنساهم ذكر الله﴾ جا یادو ناوی خوای لەبیر بردوونەوە ﴿اولئك حزب الشيطان﴾ ئا ئەوانە

گرووپەکەی شەیتانن ﴿الا إن حزب الشيطان هم الخاسرون﴾ هوشیار بن کە هەر گرووپەکەی شەیتان - لەدونیاولەقیامەتدا- زیانمەندن.

**بە سەرکەوتنی پێغەمبەران نەیارانیان قەلَس دەبن:**

﴿[٢٠] إن الذين يحادون الله ورسوله﴾ بەڕاستیی ئەوانەی دژایەتی خواو پێغەمبەرەکەی ئەکەن ﴿أولئك فى الأذلين﴾ ئەوانە لە ریزی زەبوونترینی خولّقی خوان لە دونیاو لە قیامەتدا ﴿[٢١] كتب الله لأغلبن انا ورسلى﴾ خوا بڕیاری داوە کە خۆم و پەیامبەرەکانم پیرۆزو زالّ دەبین بەسەر هەموو دوژمناندا ﴿إن الله قوى عزيز﴾ بەڕاستیی خوا خوایەکی بەهێزی بەدەسەلاتە، هەرگیز فەرمان و بڕیاری هەلّناوەشێتەوە.

**موسلّمان دۆستایەتی بێباوەڕان ناکات:**

﴿[٢٢] لاتجد قوما يؤمنون بالله واليوم الآخر﴾ هیچ کۆمەلّێ نابینیت کە باوەڕی بە خواو بە ڕۆژەکەی تر ببێت ﴿يوادون من حاد الله ورسوله﴾ دۆستایەتی ئەوانە بکەن دژایەتی خواو پەیامبەرەکەی دەکەن! ﴿ولو كانوا آباءهم او ابناءهم او إخوانهم او عشيرتهم﴾ هەرچەندە ئەوانە باوکیان، یان کوڕو نەوەیان، یا براوعەشرەتیان بن، بە کورتیی: مرۆڤی باوەڕدار نابێ بەهیچ شێوەیەك دۆستایەتی بکا لەگەلّ دوژمنانی خواو پێغەمبەردا ئەگینا لەوان دەژمێردرێن ﴿أولئك كتب فى قلوبهم الإيمان﴾ ئەوانە - کەلەدۆستایەتی دوژمنانی خوا خۆئەپارێزن- کەسانێکن خوا ئیمان و باوەڕی لەنێودڵیاندا چەسپاندووە، بەهیچ شتێ لەق نابێت، بۆیە (ئەبو عوبەیدە) لەڕۆژی (بەدر)دا باوکی خۆی کوشت، (ئەبوبەکری صدیق) بڕیاری کوشتنی (عبدالرحمن)ی کوڕی خۆیدا، (موصعەبی کوڕی عومەیر) (عوبەیدە)ی برای خۆی کوشت. (حەمزەو عەلی) چەند کەسیان لە تیرەو بنەماڵەی خۆیان کوشت، چونکە ناحەزو دژ بەئیسلام بوون ﴿وايدهم بروح منه﴾ وە پشتگیری کردوون بە سەرخستن لە لایەن خۆیەوە ﴿ويدخلهم جنات تجرى من تحتها الأنهار﴾ لەپاشە ڕۆژیشدا ئەیانباتە نێو چەند باخاتێکی بەهەشتەوەکە جۆگە ئاوی زۆر لە ژێر درەختەکانیدا ئەڕوات ﴿خالدين فيها﴾ بەهەتا هەتاییش تێیدا دەبن ﴿رضى الله عنهم ورضوا عنه﴾ خوا لێیان خۆشنوود و ڕازییبووە، ئەوانیش لە خوا ڕازیی بوون ﴿أولئك حزب الله﴾ ئا ئەوانە گرووپەکەی خوان ﴿الا إن حزب الله هم المفلحون﴾ ئاگادار وهۆشیاربن! کە هەر گرووپەکەی خوان بەرەوەکان لەدونیاو، لەقیامەتدا.

الجزء الثامن والعشرون — سورة المجادلة

لَا تَجِدُ قَوۡمٗا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ يُوَآدُّونَ مَنۡ حَآدَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَوۡ كَانُوٓاْ ءَابَآءَهُمۡ أَوۡ أَبۡنَآءَهُمۡ أَوۡ إِخۡوَٰنَهُمۡ أَوۡ عَشِيرَتَهُمۡۚ أُوْلَٰٓئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلۡإِيمَٰنَ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٖ مِّنۡهُۖ وَيُدۡخِلُهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ أُوْلَٰٓئِكَ حِزۡبُ ٱللَّهِۚ أَلَآ إِنَّ حِزۡبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴿٢٢﴾

سُورَةُ الحَشۡرِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿١﴾ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَخۡرَجَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ مِن دِيَٰرِهِمۡ لِأَوَّلِ ٱلۡحَشۡرِۚ مَا ظَنَنتُمۡ أَن يَخۡرُجُواْۖ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُم مَّانِعَتُهُمۡ حُصُونُهُم مِّنَ ٱللَّهِ فَأَتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِنۡ حَيۡثُ لَمۡ يَحۡتَسِبُواْۖ وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعۡبَۚ يُخۡرِبُونَ بُيُوتَهُم بِأَيۡدِيهِمۡ وَأَيۡدِي ٱلۡمُؤۡمِنِينَ فَٱعۡتَبِرُواْ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَبۡصَٰرِ ﴿٢﴾ وَلَوۡلَآ أَن كَتَبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡجَلَآءَ لَعَذَّبَهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابُ ٱلنَّارِ ﴿٣﴾

٥٤٥

لە (١٥)ی ڕەمەزانی (١٤١٧) ك بەرامبەر بە (١٩٩٧/١/٢٣) لەتەفسیری ئەم سوورەتە بوومەوە

لە شاری (مەریوان).

والحمدلله رب العالمين.

## ٥٩- سوورەی ( حەشر )ـە

## مەدەنییەو ( ٢٤ ) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەمیش وەك سوورەتە هاووێنەکانی خۆی باسی کۆمەڵێ ئەحکام دەکات، لەهەمان کاتیشدا تەوەرەی سەرەکی خۆی بەدەوری جولەکەکانی (بەنی نەزیر)دا دەسوڕێنێ، بەتایبەت ئەوانەیان وا پەیمانیان هەڵوەشاندوە لەگەڵ پەیامبەردا ﷺ، پاشان ئەویش ناچار بوو لەمەدینە دەریان بکا، بۆیە (ئیبن عەباس) بەم سوورەتەی ئەوت سوورەتی (بنی النضیر). فتح الباری: ٨/٤٩٧. لەولایشەوە باسێکی دوو ڕووەکان ئەکات کەچۆن لەگەڵ جوولەکاندا پەیماننامەیەکیان دژ بە پەیامبەر ﷺ مۆرکرد. بەکورتیی ئەتوانین بڵێین: ئەم سوورەتی (حەشر)ـە سوورەتی جیهاد و فەیئو غەنیمەتە.

### هەموو شتێ پاکیی و بێ عەیبیی خوا دەڵێ:

﴿بسم الله الرحمن الرحيم * ١ سبح لله ما في السموات وما في الأرض﴾ هەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی لە زەویدایە سەرجەم تەسبیح بۆخوا دکەن, واتە: لەژێر فەرمان و دەسەڵاتی ئەودا دەجوڵێنەوە, وەك لەجێگایەکی تردا دەفەرموێ: (تسبح له السموات السبع والأرض ومن فيهن وإن من شيء إلا يسبح بحمده ولكن لا تفقهون تسبيحهم). ﴿وهو العزيز الحكيم﴾ هەر ئەوخوایەیە دەستەڵاتداری کارجوان و کاردروست.

### شاربەدەرکردنی ( بەنی نەزیر ) لە ماڵ وحاڵی خۆیان:

﴿٢ هو الذي أخرج الذين كفروا من أهل الكتاب من ديارهم لأول الحشر﴾ هەر ئەوخوایە بووخاوەن نامە بێباوەڕەکانی لەخانەولانەی خۆیان لە (مەدینە) بۆ یەکەمجار دەرپەڕاند, ئاخرجاریش لە (خەیبەر)و لە نیوەدوورگەی عەرەبیدا (عومەر) ڕایگواستن بۆ شام، جابەو شێوەیە تووشی ئەو ڕیسوایی و ژێر دەستەیی یە بوون. پەیامبەرﷺ کاتێ هاتە مەدینە لەگەڵ (بەنی نەزیر)دا ڕێککەوت کە: وەك پشتیوانی لێناکەن، دڕکیش نەبن لەڕێیدا، بەڵکو بۆخۆیان دانیشن و هەقی هیچیان نەبێت، بەڵێ بەوشێوەیە مانەوە تاڕووداوەکەی (بەدر)، ئەوجا وتیان وائێستا زیاتر دەرکەوت کە موحەممەد پەیامبەری خوایە، کەچی کاتێ ڕووداوەکەی (ئوحود) پێش هات, هەموو بەجارێ دەستیانکردە دیعایەو چاوو ڕاو فرت و فێڵ، بۆیە بەپەلە (کەعبی کوڕی ئەشرەف)یان لەگەڵ چل سوارچاکدا ناردە مەککە، لەوێ لەگەڵ (ئەبووسوفیان)دا دژ بەپەیامبەر ﷺ پەیمانیان مۆرکرد,پاشان پەیامبەریش ﷺ فەرمانی بە(موحەممەدی کوڕی مەسلەمە)دا: بچێت (کەعب)بکوژێت، ئەویش بەپەنامەکی چووو کوشتیی، پاشان سوپایشی ناردەسەریان و ماوەیەك لەگەمارۆدا مانەوە، دەرەنجام مەدینەیان بەجێهێشت و بەرەو (خەیبەر) ڕۆیشتن، لەسەردەمی (عومەری کوڕی خەتتاب)یشدا بەرەو شام ڕاگوازران ﴿ماظننتم أن يخرجوا﴾ ئێوە گومانتان نەدەبرد ئاوا بەو ڕیسواییەو سەرشۆڕییە لە قەڵاکانیان بچنە دەرێ، چونکە ئەوان خاوەنی هێز و دەسەڵات بوون لەمەدینەدا ﴿وظنوا أنهم مانعتهم حصونهم من الله﴾ خۆشیان گومانیان وابوو کە قەڵاو سەنگەرە مەحکەمەکانیان لەسزای خوا ئەیانپارێزێ و مەنعیان ئەکا لەموسڵمانەکان ﴿فأتاهم الله من حيث لم يحتسبوا﴾ جاخوا بۆیان هات بەسزا لەشوێنێکەوەبە خەیاڵیاندا نەهاتبوو شتی وا ڕووبدات ﴿وقذف في قلوبهم الرعب﴾ وە بەکوشتنی (کەعب) ترس وبیمی خستەدڵیانەوە.. لەفەرموودەیەکدا هاتووە: ((نصرت بالرعب بين يدي مسيرة شهر)) بوخاریی.واتە:من بەهۆی ترس خستنە ناودڵی دوژمنەوە ئەندازەو ماوەی مانگەڕێیەك یارمەتی درام و سەرکەوتم! ﴿يخربون بيوتهم

﴿بأيديهم وأيدى المؤمنين﴾واترسان بەناچاری ماڵەکانیان بەدەستی خۆیان و بەدەستی خاوەن باوەڕەکان وێرانکرد.
(بەنی نەزیر) پێش ئەوەی لە مەدینە دەرچن, بەربوونە ڕووخاندنیخانووەکانیان، تا موسڵمانەکان پاش ئەوان سوودی
لێوەرنەگرن و نەیکەنە ماڵ و نیشتگای خۆیان ,پاشان موسڵمانەکانیش دیوارەکانیان ڕووخاندبۆ تەصفییەی
شوێنەواریان! ﴿فاعتبروا یا أولى الابصار﴾ دەسائێوە پەند وەرگرن ئەی خاوەن فامەکان!﴿ولولا أن كتب الله عليهم
الجلاء﴾ وەئەگەر خوا شاربەدەرکردنی لەسەر بڕیارنەدابان ﴿لعذبهم فى الدنيا﴾ هەر لە دنیادا (وەك بەنی قورەیزە)
بەکوشتن ودیلکردن سزای ئەدان ﴿ولهم فى الآخرة عذاب النار﴾ ولەپاشە ڕۆژیشدا سزای ئاگری دۆزەخیان بۆ هەیە
﴿٤ ذلك بأنهم شاقوا الله ورسوله﴾ ئەو دەرکردنەش بە هۆی ئەوەی دژایەتیی خواو پەیامبەرەکەیان کرد ﴿ومن يشاق
الله فإن الله شديد العقاب﴾ وەهەرکەسیش دژایەتی خوا
بکات، بێگومان خوا سەختگیرە بۆ ئەوەی دژایەتی بکا.

الجزء الثامن والعشرون | سورة الحشر

ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ شَآقُّوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ۖ وَمَن يُشَآقِّ ٱللَّهَ فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٤﴾ مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَآئِمَةً عَلَىٰٓ أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ ٱللَّهِ وَلِيُخْزِىَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٥﴾ وَمَآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْهُمْ فَمَآ أَوْجَفْتُمْ عَلَيْهِ مِنْ خَيْلٍ وَلَا رِكَابٍ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُۥ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٦﴾ مَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْ أَهْلِ ٱلْقُرَىٰ فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ كَىْ لَا يَكُونَ دُولَةًۢ بَيْنَ ٱلْأَغْنِيَآءِ مِنكُمْ ۚ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٧﴾ لِلْفُقَرَآءِ ٱلْمُهَٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَٰرِهِمْ وَأَمْوَٰلِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا وَيَنصُرُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ﴿٨﴾ وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلْإِيمَٰنَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِى صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّآ أُوتُوا۟ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٩﴾

٥٤٦ | وَٱلَّذِينَ جَآءُو

**بڕینی دارخورماکان بەئیزنی خوا بوو:**

﴿٥ ماقطعتم من لينة أو تركتموها قائمة على اصولها
فبإذن الله﴾ هەر دارخورمایەکتان لەباخەکانی (بەنینەزیر)
بڕیی -بەهۆی هەڵوەشانەوەی پەیمانەکەیانەوە- یان
لێیگەڕان بەراوەستاوی لەسەر بنجی خۆی ,ئەوە
لەهەردووبارەکەدا بە فەرمانی خوابوو بۆ ئەوی ئیمانداران
بەهێز بکا ﴿وليخزى الفاسقين﴾ و لەسنووردەرچووەکانیش
ڕیسوابکات. جا لەبڕینی ئەوباخ و باخاتانەوە زانایان
وەریانگرتووە کە: لەکاتی ناچاریی و لە کاتی جەنگدا
ڕەوایە دارو درەخت وکشت وکاڵ و گەنم و دانەوێڵەو
خانووبەرەی دوژمن بڕوخێنرێ و بسوتێنرێ، تاهێز وپێزی
دوژمن لەناو ببرێت ,بۆیە پەیامبەر ﷺ کاتێ نزیکی باخ و
باخاتەکانیان بووەوە فەرمانی بەبڕینی باخەکانیان دا، بەڵام
ئەوانی نەفام لێیان کردە هەرا!، ئینجا خوا فەرمووی: ئەو
لەخۆیەوە هیچ شتێکی نەکردووە، بەڵکو هەموو بەپێی
بڕیاری خوابووە، (واحدى) لە (أسباب النزول)ە کەیدا ئەمەی هێناوە.

**دەستکەوتی فەیئو دابەشکردنی:**

﴿٦ وما افاء الله على رسوله منهم﴾ وئەوەی خوا گێڕایەوە بۆ پێغەمبەرەکەی, لەدارایی جوولەکەکانی (بەنی
نەزیر) ﴿فما اوجفتم عليه من خيل ولاركاب﴾ ئێوە هیچ ئەسپ و وشترێکتان بۆتاو نەدابوو، واتە:هیچ زەحمەتێکتان
نەکێشابوو ﴿ولكن الله يسلط رسله على من يشاء﴾ بەڵام خوا پێغەمبەرانی خۆی بەسەر هەرکەسێکدا حەز بکا زاڵ
ئەکات بەبێ جەنگ , وەك چۆن پێغەمبەری زاڵکرد بەسەر (بەنی نەزیر)دا بەترس خستنە دڵیانەوە , واتە:
دەسکەوتەکەی(بەنی نەزیر) تایبەتمەندی پەیامبەربوو (موحەممەد)ﷺ، ماف وەهەقی هاوەڵانی تێدانییە، بۆیە
ئەویش دەتوانێ پێویستی یەکساڵی ماڵ ومنداڵی لێوەرگرێت، پاشان ئەوی دیکەش بدات بەچەك و تەقەمەنیو

خۆئامادەکردن بۆ ڕێی خوا. (بوخاریی و موسلیم و ئەبوداوودو تیرمزیی و نەسائی) ئەمەیان ڕیوایەتکردووە.﴿واللە علی کل شئ قدیر﴾ وخواش دەسەڵاتی بەسەر هەمووشتێکدا هەیەو ویستی لە هەرشتێ بێت ئەیکات. ﴿[٧] ما أفاء اللە علی رسولە من أهل القری﴾ ئەوەی خوا گێڕایەوە بۆپێغەمبەرەکەی لە (فەیئی)شارەکان بەبێ کوشتار,وەك شاروگوندەکانی (بەنی قورەیزە) و(بەنی نەزیر)و گشت شاروگوندێکی ئاوا بەبێ جەنگ، وەك (فەدەك، خەیبەر) ﴿فللە وللرسول﴾ ئەوە بۆخوایە، واتە: بڕیارەکەی بەدەستی ئەوە ,چی لێ ئەکات، ئەیکات, وەبۆپەیامبەرە، ئەویش بۆخۆیی‌و ژن وماڵی‌وبۆبەرژەوەندی موسڵمانانی بەخت ئەکات ﴿ولذی القربی والیتامی والمساکین﴾ و بۆخزمانی نزیکی لەنەوەی(هاشم)و نەوەی(موتتەلیب) وەبۆ منداڵانی بێ‌باوك و بۆداماوو بێ‌نەوایان ﴿وابن السبیل﴾ و ڕێبواران , واتە:ئەوانەی کە لەسەفەردا توێشوویان لێ‌ئەبڕێ، ئەگەرچی دەوڵەمەندیشبن. بەڵێ سەروەت وسامانی (فەیئ) ئەکرێ بەپێنج بەشەوە، پاشان پێنج یەکێکی ئەکرێتەوە پێنج بەش، ئەمیش بۆپەیامبەرو خزمەنزیکەکانیی وهەتیوان وهەژاران سەرف ئەکرێ، وە چوار بەشەکەی دیکەیش بۆپەیامبەر ﷺ دادەنرێ، ئەویش لەماڵ و منداڵی خۆیی و بەرژەوەندی موسڵماناندا بەختی ئەکات.. بۆیە دەستکەوتەکەی (بەنی نەزیر)ی بەسەرکۆچەریەکاندا بەشکردوو، بەشی یارمەتیدەرەکانی (واتە:ئەنصار)ی لێنەدا، دوو پیاویان نەبێ,چونکە ژیان و زیندەگی ئەنصار لەکۆچەرییەکان باشتر بوو, بۆیە قورئان ئەفەرموێ: ﴿کیلا یکون دولة بین الأغنیاء منکم﴾ بڕیارە بەو شێوەیە دابەش بکرێ ,نەك ببێتە سەرمایەی دەستەودەستکردن لەناو دەوڵەمەندەکانتانداو ,هەژارەکان لێی بێ‌بەش ببن ﴿وما آتاکم الرسول فخذوە﴾ وەهەرچی‌پەیامبەر ﷺ پێیدان وەری بگرن ,واتە:بەچی فەرمانی پێ‌کردن بیکەن چ لەم دەستکەوتەدا و، چ لەهەرشتێکی تردا جێبەجێی بکەن. ﴿ومانهاکم عنه فانتهوا﴾ وە ڕێیشی لەهەر شتی لێگرتن، ئێوەش دەستی لێهەڵگرن ﴿واتقوا اللە﴾ وخۆتان لە خەشم وغەزەبی خوا بپاێزن بە جێبەجێکردنی‌فەرمانەکانی ووازهێنان لەقەدەغەکراوەکانی ﴿إن اللە شدید العقاب﴾ بەڕاستیی خوا سەخت تۆڵەیە، قاری لەهەرکەسێك گرت ڕزگاری نابێ.

**فەیئ بۆ خەڵکانی هەژارو ئاوارەیە:**

﴿[٨] للفقراء المهاجرین الذین أُخرجوا من دیارهم وأموالهم﴾ ئەو فەیئو دەستکەوتەیە بۆئەوهەژارە دوورە وڵات و کۆچکردووانەیە لەخانووو سامانی خۆیان دەرکران ,لەلایەن مەککەییەکانەوە، تا بەڵکو وردە وردە ژیانیان ڕاست بکرێتەوەو بگاتەوە ئاستی ئاسایی‌خۆی، پاش ئەوەی کە بتپەرستەکانی مەککە هەڵیان فڕاندن و ناچاریان کردن بە هیجرەت ﴿یبتغون فضلا من ربهم ورضوانا﴾ داوای چاکەو ڕەزامەندیی لە خوا دەکەن,بۆیە نەیانتوانی لەمەککەدا بژین، ئەگینا لەگەڵیاندا خۆیان ئەسازاند ﴿وینصرون اللە ورسولە﴾ و یارمەتی خواو پەیامبەرەکەی دەدەن بۆیە کۆچیان کرد..﴿أولئك هم الصادقون﴾ ئا ئەوانەن ڕاستگۆکان لەباوەڕو جیهادیاندا.

**پشتیوانان ئێرەیی بە کۆچبەران نابەن:**

ئینجا خوا ستایشی پیاوەتیی وچاکەی یارمەتیدەرەکان ئەکات، پاش ئەوەی کەدەستکەوتی (بەنی‌نەزیر) درا بەکۆچکەران و ئەوان هیچ دڵگرانی و گلەییەکیان نیشان نەدا، بۆیە ئەفەرمووێ: ﴿[٩] والذین تبوءوا الدار والإیمان من قبلهم﴾ و ئەوکەسانەی نیشتەجێی(دار الهجره)و(دارالإیمان) ببوون,واتە:پشتیوانان لە پێش کۆچی کۆچەریەکان ﴿یحبون من هاجر إلیهم﴾ کۆچەریەکانیان خۆش دەوێن و,بەشێك لەدارایی خۆیانیان ئەدەنێ ودڵخۆشیان دەکەن ﴿ولا یجدون فی صدورهم حاجة مما أوتوا﴾ و هیچ شتێکیان لە دڵدا نیە سەبارەت بەوەی بە کۆچەریەکان درا

لەفەیئی بەنی‌نەزیر,چونکە پەیامبەری خوا ﷺ لەوهەموو دەستکەوتە تەنها بەشی سێ کەسیانیدا، لەگەڵ ئەوەیشدا
کەسێك نەبووپێناخۆش بێت ﴿ويؤثرون على انفسهم ولو كان بهم خصاصة﴾ و ئیساری کۆچەریەکان دەکەن بە
سەرخۆیاندا لە سەروەت وساماندا,ئەگەرچی خۆیشیان نیازیان پێی هەبێو هەژاربن , واتە:بەخشینەکەیان لەبەر
دەوڵەمەندیان نیە، بەڵکو سروشتی ئیمان و باوەڕیان بەرزە ﴿ومن يوق شح نفسه﴾ وهەرکەسێ لەسیفەتی رژدی
درووزنی‌بپارێزرێ , واتە: هەرکەسێ خوا بیپارێزێ لە چرووکی دەروونی ﴿فأولئك هم المفلحون﴾ جائەوانەن
بەرەوەکان. تێبینی:مەبەست بە سەخاوەت ئەوە نیە هەرچی ماڵ و سامانی هەیە بیبەخشێ، نەخێر، چونکە ئەوەتە
(ئەنەس) ئەڵێ: پەیامبەر ﷺ فەرمووی: ئەو کەسەی زەکات بدات، میوانداریی بکات، لەکاتی بەڵاونەهامەتدا
ببەخشێ.. ئەوە لەرژدیی وچرووکی دەرچووە ﴿[10] والذين
جاءوا من بعدهم يقولون﴾ ئەوانەش لەدوای
ئەوانەوەهاتوون، واتە:پاش کۆچکەران و یارمەتیدەرانەوە
هاتوون , دەڵێن:﴿ربنا اغفر لنا ولإخواننا الذين سبقونا
بالإيمان﴾ ئەی پەروەردگارەکەمان! لە ئێمەو لەو برایانەمان
پێش ئێمە باوەڕیان هێناوە خۆشببە ﴿ولا تجعل فى قلوبنا
غلا للذين آمنوا﴾ وهیچ بوغزوقینێك مەخە دەڵمانەوە بەامبەر
بەوکەسانە باوەڕیان هێناوە ﴿ربنا إنك رؤوف رحيم﴾ ئەی
پەروەردگاری ئێمە! بەڕاستیی تەنها ئەتۆی بەسۆزی
میهرەبان. پێشەوا (عومەر) گوێی لەپیاوێکەوەبوو
باسی‌موهاجیرانی بەچاك دەکرد! ئەویش ئایەتی (للفقراء
المهاجرين)ەی بۆ خوێندەوەو، فەرمووی: ئایا تۆوەك ئەوان
دەبی؟ وتی: نەخێر، پاشان ئایەتی (والذين تبؤوا الدار
والإيمان)ەی بەسەرا خوێندەوەو فەرمووی: ئەی وەك
ئەودەستە دەبیت؟؟ کابرا وتی: نەخێر، پاشان ئایەتی:
(والذين جاؤوا من بعدهم..)ی بۆخوێندەوەو فەرمووی: ئەی
لەمانەیت؟ کابرا وتی: بەتەمام لەمانەبم. پێشەوا (عومەر)
فەرمووی: دەچاك بزانە هەرکەسێك بەباشی ناویان نەباو,بگرەلەباتی ئەوە جنێویان پێبدات، باچاك بزانێت
لەهیچکام لەو ئیماندارانە نیە. واتە: لەهەر سێ تاقمەکە بێ بەشە. بێجگە لەوەش پێشەوا (مالیك) دەڵێت: ئەو
کەسەی جوێن بەهاوەڵان دەدات کافرەو لە (فیئ)یش بەش نابات.

الجزء الثامن والعشرون سورة الحشر

وَالَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعۡدِهِمۡ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا
وَلِإِخۡوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَا تَجۡعَلۡ فِي قُلُوبِنَا
غِلّٗا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٞ رَّحِيمٌ ﴿١٠﴾ ۞ أَلَمۡ تَرَ إِلَى
ٱلَّذِينَ نَافَقُواْ يَقُولُونَ لِإِخۡوَٰنِهِمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ
ٱلۡكِتَٰبِ لَئِنۡ أُخۡرِجۡتُمۡ لَنَخۡرُجَنَّ مَعَكُمۡ وَلَا نُطِيعُ فِيكُمۡ
أَحَدًا أَبَدٗا وَإِن قُوتِلۡتُمۡ لَنَنصُرَنَّكُمۡ وَٱللَّهُ يَشۡهَدُ إِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ
﴿١١﴾ لَئِنۡ أُخۡرِجُواْ لَا يَخۡرُجُونَ مَعَهُمۡ وَلَئِن قُوتِلُواْ لَا يَنصُرُونَهُمۡ
وَلَئِن نَّصَرُوهُمۡ لَيُوَلُّنَّ ٱلۡأَدۡبَٰرَ ثُمَّ لَا يُنصَرُونَ ﴿١٢﴾
لَأَنتُمۡ أَشَدُّ رَهۡبَةٗ فِي صُدُورِهِم مِّنَ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَوۡمٞ
لَّا يَفۡقَهُونَ ﴿١٣﴾ لَا يُقَٰتِلُونَكُمۡ جَمِيعًا إِلَّا فِي قُرٗى
مُّحَصَّنَةٍ أَوۡ مِن وَرَآءِ جُدُرِۭۚ بَأۡسُهُم بَيۡنَهُمۡ شَدِيدٞۚ تَحۡسَبُهُمۡ
جَمِيعٗا وَقُلُوبُهُمۡ شَتَّىٰۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَوۡمٞ لَّا يَعۡقِلُونَ ﴿١٤﴾
كَمَثَلِ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ قَرِيبٗاۖ ذَاقُواْ وَبَالَ أَمۡرِهِمۡ وَلَهُمۡ عَذَابٌ
أَلِيمٞ ﴿١٥﴾ كَمَثَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ إِذۡ قَالَ لِلۡإِنسَٰنِ ٱكۡفُرۡ فَلَمَّا كَفَرَ
قَالَ إِنِّي بَرِيٓءٞ مِّنكَ إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٦﴾

٥٤٧

## مونافقەکان درۆیان لەگەڵ بەنی نەزیر کرد:

﴿[11] الم تر إلى الذين نافقوا﴾ ئایا ئەو دووڕوانەت نەدی؟! کە وتەوکرداریان چەندە لەیەك دوورە ﴿يقولون
لإخوانهم الذين كفروا من أهل الكتاب﴾ و بەبراکانیان لەکافرەکانی‌خاوەن نامەکانیان دەگوت ,واتە:بە (بەنی نەزیر)
﴿لئن اخرجتم لنخرجن معكم﴾ دڵنیابن ئەگەر ئێوە لەمەدینەدەر کران ,ئێمەش لەگەڵتان دەرئەچین و مەدینە بەجێ
دێڵین، دیارە ئەمە سەرۆکی دووڕووەکان (کورەکەی سەلول)ە، ئەونیفاق و دووڕووییە بەوشێوەیە بەخەرج ئەدات،

مەبەستیشی ئەوەیە کەئەوان لە قەڵاکانی خۆیاندا بمێننەوەو خۆیان بەدەستەوە نەدەن وجەنگ بکەن لەگەڵ موسڵمانەکاندا! ﴿ولا نطيع فيكم أحدا أبدا﴾ وهیچکاتیش بەزیانی ئێوە بەگوێی هیچ کەسێك ناکەین. واتە: لەبەرامبەر ئێوەوە, یارمەتی (موحەممەد) نادەین ﴿وإن قوتلتم لننصرنكم﴾ وئەگەر جەنگیشتان لەگەڵ کرا حەتمەن یارمەتیتان ئەدەین ﴿والله يشهد إنهم لكاذبون﴾ وخوا شایەتی‌دەدا کە بەڕاستیی‌ئەوان درۆزنن و درۆدەکەن لەوەی دەیڵێن ﴿[١٢] لئن أخرجوا لا يخرجون معهم﴾ بەتەئکید ئەگەر دەرکران لە مەدینە، دووڕووەکان لەگەڵیان دەرناچن ﴿ولئن قوتلوا لا ينصرونهم﴾ وەئەگەر جەنگیشیان لەگەڵ کرا، یارمەتییان نادەن ,دەرەنجامیش هەروادەرچوو، چونکە جوولەکە لەمەدینە دەرکران و جەنگیان لەگەڵکرا، مونافقەکانیش هیچیان نەکرد! ﴿ولئن نصروهم﴾ گریمان ئەگەر یارمەتیشیان دان ﴿ليولُن الأدبار﴾ بێ‌شك دوای تاوێك پشت هەڵئەکەن و هەڵدێن و ریزەکانی جەنگ بەجێ دێڵن ﴿ثم لا ينصرون﴾ پاشان یارمەتیان نادرێ لە لایەن خواوە ﴿[١٣] لأنتم أشد رهبة في صدورهم من الله﴾ بەڕاستی ئێوە لەدڵیاندا بەسامترن لەخوا! واتە:لەئێوە زۆرتر ئەترسن لەخوا، بۆیە ناوێرن جەنگتان لەگەڵ بکەن ﴿ذلك بأنهم قوم لا يفقهون﴾ ئەوەش بەهۆی ئەوەی کە ئەوان کۆمەڵێکن تێناگەن لەگەورەیی ودەسەڵاتی خوا ﴿[١٤] لا يقاتلونكم جميعا إلا في قرى محصنة﴾ ئەوەندە ترسنۆکن -هۆزی جوولەکە- کوشتارتان لەگەڵ ناکەن بەکۆمەڵ,مەگەر لەو شارانەدا بەقەڵاو خەندەق قاییمکراون ﴿أو من وراء جدر﴾ یان لەپشتی دیوارەکانی ماڵکانیانەوە ﴿بأسهم بينهم شديد﴾ چونکە دژایەتیی ناوخۆیان دژایەتیەکی‌سەختە ﴿تحسبهم جميعا﴾ وادەزانیت هەموو پێکەوەن وکۆن ﴿وقلوبهم شتى﴾ لەکاتێکدا دڵەکانیان لێکجیان ویەك ناگرن ﴿ذلك بأنهم قوم لا يعقلون﴾ ئەوەش چونکە ئەوانە گەل وکۆمەڵێکن تێناگەن لە دەرەنجامی کاری خۆیان , نازانن تەفرەقەو پەراگەندەبوون هۆی سەرەکیە بۆ تێکشکان، وە وەحدەت و برایەتیی وتەباییش تاکە هۆیە بۆپیرۆزیی و سەرکەوتن ﴿[١٥] كمثل الذين من قبلهم قريبا﴾ حاڵی‌جوولەکەکانی (بەنی‌نەزیر) لە حاڵی ئەوانە دەچێت کەلەپێشیانەوەبوون ,واتە: کت ومت لە حاڵی(بەنی قەینوقاع) دەچێت , کەئەوانمان لەناومان برد،ئیتر نەئەبوو ئەمان ئاوا خۆیان بەقڕ بدەن، چونکە بیستبوویان چیمان بەسەر گەلانێکی پێشوودا هێنا ﴿ذاقوا وبال أمرهم﴾ تۆڵەی کاری خۆیان چێشت ,ئەوەبوو لەجەنگی (بەدر)دا دەرەنجامی تۆڵەی کاری خراپی خۆیانیان دەستگیربوو، بەدەرکردن، یان بەکوشتن ﴿ولهم عذاب أليم﴾ ولە قیامەتیشداسزایەکی بەئێشیان بۆهەیە.

**لە دەستخەڕۆکردندا, کاری جوولەکەودووڕووەکان ,لە کاری شەیتان دەچێ:**

﴿[١٦] كمثل الشيطان إذ قال للإنسان اكفر﴾ نموونەی دووڕووەکان لە هەڵنانی جوولەکەی بەنی نەزیر لە بۆکوشتار لە گەڵ پێغەمبەرو موسڵمانەکاندا, وەك نموونەی هەڵنانی شەیتان وایە بۆ کافر کردنی مرۆڤ, کاتێ پێیوت کافربە من لە گەڵتم ﴿فلما كفر قال إني بريء منك﴾ جا کاتێ بێباوەڕبوو وتی: بەڕاستیی من بەریی و بێزارم لەتۆ ﴿إني أخاف الله رب العالمين﴾ بەڕاستیی من لەخوای پەروەردگاری جیهانەکان، ئەترسم!! جائەوەبوو دووڕووەکانیش جوولەکەکانیان دەستخەڕۆکردن و هەڵیاننان و بەڵێنیان دانێ کە لەناوەوە -کاتێ بەجەنگ هاتن- یارمەتییان بدەن، بەڵام لەکاتی‌خۆیدا هیچیان بۆنەکردن! ﴿[١٧] فكان عاقبتهما أنهما في النار خالدين فيها﴾ دەرەنجامی‌کاری هەردووکیان (شەیتان و ئادەمزادی کافر) ئەوەیە کە بەڕاستیی هەردوو لەئاگری دۆزەخدا هەمیشەماون ﴿وذلك جزاء الظالمين﴾ و ئەومانەوەیەش بە هەمیشەیی لە ئاگردا سزای ئەوکافرانەیە کەستەمیان لە

خۆیان کردووه, واته:هەرکەسێك لەسنوور دەرچێ و فرت و فێڵ بکات ,پاداشتەکەی ئاوایە، جا کەوایە ئێوەیش هۆشیار بن و نەخەڵەتێن بەقسەی زل و فیشاڵی ئەم وئەو.

**له خوا بترسن و بۆ سبەینێ ئامادە بن:**

پاش باسکردنی فێڵ وفەرەجی جوولەکەو دووڕووەکان و ئەنجامیان، روو دەکاتە باوەڕدارە راستەقینەکان و ئەفەرموێ: ﴿[١٨] یاأیهاالذین آمنوا اتقوا الله﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! پارێز لەخوا بکەن بە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی و دوور گرتن لە قەدەغەکراوەکان ﴿ولتنظر نفس ماقدمت لغد﴾ وەبا هەرکەسە سەرنج بداو بزانێ چ شتێکی بۆ سبەینێ(قیامەت) پێشخستووە لە کردەوەی چاك؟ ﴿واتقوا الله﴾ وەدەوام بکەن لە سەر تەقوای خوا ﴿إن الله خبیر بما تعملون﴾ بەڕاستیی خوا زۆر ئاگایە بەکارەکانتان و هیچی لێ‌ون نابێت ﴿[١٩] ولا تکونوا کالذین نسوا الله﴾ وەئێوە وەك ئەو کەسانە مەبن خوایان لەبیر کردبوو گوێیان بە فەرمانەکانی نەدەدا ﴿فأنساهم انفسهم﴾ ئینجا خوایش -واسەرگەردانیکردن - خۆیان لەبیرکرد و نەیانزانی کارێکی وابکەن لەپاشەڕۆژدا سوودیان پێبدات ﴿اولئك هم الفاسقون﴾ هەرئەوانەن لە تاعەتی خوا دەرچوان, بۆیە خواش ئاوا وێڵی کردوون و لێیان ناپرسێتەوە.

فَكَانَ عَٰقِبَتَهُمَآ أَنَّهُمَا فِي ٱلنَّارِ خَٰلِدَيۡنِ فِيهَاۚ وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُاْ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٧﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَلۡتَنظُرۡ نَفۡسٞ مَّا قَدَّمَتۡ لِغَدٖۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴿١٨﴾ وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ نَسُواْ ٱللَّهَ فَأَنسَىٰهُمۡ أَنفُسَهُمۡۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴿١٩﴾ لَا يَسۡتَوِيٓ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۚ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِ هُمُ ٱلۡفَآئِزُونَ ﴿٢٠﴾ لَوۡ أَنزَلۡنَا هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ عَلَىٰ جَبَلٖ لَّرَأَيۡتَهُۥ خَٰشِعٗا مُّتَصَدِّعٗا مِّنۡ خَشۡيَةِ ٱللَّهِۚ وَتِلۡكَ ٱلۡأَمۡثَٰلُ نَضۡرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِۖ هُوَ ٱلرَّحۡمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٢٢﴾ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡمَلِكُ ٱلۡقُدُّوسُ ٱلسَّلَٰمُ ٱلۡمُؤۡمِنُ ٱلۡمُهَيۡمِنُ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡجَبَّارُ ٱلۡمُتَكَبِّرُۚ سُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴿٢٣﴾ هُوَ ٱللَّهُ ٱلۡخَٰلِقُ ٱلۡبَارِئُ ٱلۡمُصَوِّرُۖ لَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٢٤﴾

سُورَةُ المُمتَحنَة

**بەهەشتی و جەهەننەمی وەکو یەك نین:**

ئینجا بۆ هەڵنانی ئادەمزادەکان، خوای کارجوان پاشەڕۆژی دۆزەخیی و، بەهەشتیی هەڵئەسەنگێنێ و ئەفەرموێ: ﴿[٢٠] لا یستوی أصحاب النار واصحاب الجنة﴾ هاوەڵانی دۆزەخ و، هاوەڵانی بەهەشت یەکسان و بەرامبەرنین لەتەرازووی دادگەریی خوادا ﴿أصحاب الجنة هم الفائزون﴾ هەرهاوەڵانی بەهەشتن براوەکان.

**مەزنیی و گەورەیی قورئان:**

ئینجا بۆئەوەی کەجوولەکەو دووڕووەکان لەهیچ سەردەمێکدا موسڵمانان نەخەڵەتێنن، دەست نیشانی ماموستاو ڕابەرێکی بێ‌وێنەیان (قورئان) بۆ ئەکاو ئەفەرموێ: ﴿[٢١] لو انزلنا هذا القرآن علی جبل لرایته خاشعا متصدعا من خشیة الله﴾ ئەگەر "گریمان" ئەم قورئانەمان دابزاندایە سەرکێوێك , کە دەرکی کردبا بەوەی تیایەتی,ئەوەدەمە دەتبینی بە کزیی و پارە پارەبوویی لە ترسی خوا! کەوابوو ئێوە بیرێ بکەنەوە ئەی ئادەمزادەکان! لەخوا بترسن و تەنها قورئان بکەنە بەرنامەی خۆتان ﴿وتلك الأمثال نضربها للناس﴾ وئێمە ئەم نموونانە لەقورئاندا بەچەند شێوەو وێنەیەك دێنینەوە بۆخەڵکی ﴿لعلهم یتفکرون﴾ بەشکو بیربکەنەوەو تێبگەن و بەکوێرانە نەچن بەسەرقورئاندا.

**بەناوو سیفەتە جوانەکانی خوا پیاهەڵدە:**

ئیترپاش ئەمانە خوا چەند سیفاتێکی بەرزو بڵندو بۆخۆی باس دەکات تاخەڵکی زیاتر شەرمی لێبکات، بۆیە ئەفەرموێ: ﴿٢٢ هوالله الذی لاإله إلاهو﴾ خوا هەر ئەوخوایە -کە بێجگە لەخۆی- هیچ پەرستراوێکیتر بە هەق نیە مافی پەرستنی هەبێ ﴿عالم الغیب والشهادة﴾ زانای نادیاروئاشکراکانە، هەموو شتێك لای ئەو یەکسانە ﴿هو الرحمن الرحیم﴾ هەرئەوە بەبەزەییومیهرەبان لەدونیاولەقیامەتدا ﴿٢٣ هو الله الذی لاإله إلا هو﴾ خوا(الله) هەر ئەوەیە -کە بێجگە لەو-هیچ پەرستراوێکیتر بە هەق نیە ﴿الملك﴾ پاشاو فەرمان ڕەوای هەموو بوونەوەرە، خاوەنی تەواوی ئیش وکارە، چیئەکات باڵا دەستی نیە ﴿القدوس﴾ پاك و بێگەردە و بێخەوشە لە هەر سیفەتێکی ناشیرین ﴿السلام المؤمن﴾ ئاشتیدەرو دڵنیاکەرە، پەیامبەران وئیماندارانی ئەمین کردووە لەسزای خۆی ﴿المهیمن﴾ چاودێرو پارێزەری دروستکراوەکانیەتی و هیچ شتێکی لێگوم نابێت ﴿العزیز﴾ دەسەڵاتدارو بەزەبرە ﴿الجبار﴾ خاوەن شکۆو مەزنە, هەمووهێزێك ئەشکێنێ و، هیچ شتێك نیە بەرگەی بگرێت ﴿المتکبر﴾ شایشتەی هەموو کیبریاییو گەورەیی ﴿سبحان الله عما یشرکون﴾ پاکیی و بێخەوشی بۆئەو خوایە لەوەی ئەوانە دەیکەن بە شەریك بۆی ﴿٢٤ هو الله الخالق البارئ﴾ هەر ئەوە پەرستراوو دروستکەرو بەدیهێنەر بێ وێنە ﴿المصور﴾ هەرئەوە وێنەکێش ودیمەن بەخش، بەهەر شێوەیەك خۆی بیەوێ نەخشەی دەکێشێ: جوان، ناشیرین، کورتە باڵا، کەڵەگەت، ڕەش پێست..هتد ﴿له الأسماء الحسنی﴾ هەمووناوەجوانەکان بۆ ئەون. زاناکان ئەڵێن: ناوەپیرۆزەکانی خوا (توقیف)ین، واتە:دەبێ خوا هەربەو ناوانەوە ناو ببرێ لەقورئان وسوننەتدا هاتوون، کەوابوو ناڕەوایە بەئارەزووی خۆمان ناوێکی بۆهەڵبژێرین،یان سیفەتێکی بۆدابنێین، ئەو بەوە ناویخۆی نەبردبێت، وەك:ئەندازیار، پزیشکی دڵەکان, هێز..هتد! ﴿یسبح له مافی السماوات والأرض﴾ هەرچی لەئاسمانەکان و، لە زەویدایە پاك وخاوێنی و بێخەوشی ئەوئەڵێن ﴿وهو العزیز الحکیم﴾ وەهەرئەویشە خوای باڵا دەستی کارجوان و کارزان, هەمووشتێکی لەجێگای خۆیدایەو، زوڵم وستەمیش لەکەس ناکات.

بۆ گەورەیی و فەزیڵەتی سوورەتی (حەشر)ـە, ئیمامی (تیرمزی) و ئیمامی (ئەحمەد) لە (مەعقەل)ەوە دەگێڕنەوە: کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوکەسەی ڕۆژ دەکاتەوەو سێجاران دەڵێت: ((أعوذ بالله السمیع العلیم من الشیطان الرجیم)). پاشان سێئایەت لە کۆتائایەتەکانی سوورەتی (حەشر) بخوێنێت، ئەوڕۆژە تائێوارە خوا حەفتاهەزار فریشتە دەنێرێت: درووودوصەڵەواتی بۆبنێرن ,خۆئەگەر مردیش ئەوڕۆژە، ئەوا بەشەهیدی دەمرێت، هەر ئابەوشێوەیەیش ئەگەر ئێوارانیش بیخوێنێت.

سەبارەت بەناوە پیرۆزەکانی خوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((إن لله تسعا و تسعین إسما، مائة إلا واحدا، من أحصاها دخل الجنة، وهو وتر یحب الوتر)) فتح الباری: ٤١٧/٥، مسلم: ٢٠٦٢/٤. واتە: خوا (٩٩) ناوی هەیە، دڵنیابە هەرکەسێك فێریان ببێ و لەبەریان بکاوقەدریان بزانێ دەڕواتە بەهەشتەوە، ئەوە خوای دلۆڤانە بۆخۆی تاك و تەنیایە هەمیشە شتیتاکی خۆش دەوێت.

تێبینی:لەسوورەتی (ئەعراف)یشدا,ئایەتی(١٨٠) ناوەپیرۆزەکان وشتێك لە بارەیانەوە نووسراوە,دەتوانی بگەڕێیتەوە بۆ ئەوێ سوود وەرگریت.

لەنووسینی تەفسیری سوورەتی (حەشر) بوومەوە , لە (مەریوان)، لە (٢١)ی ڕەمەزانی ١٤١٧ك،

بەرامبەر بە (١٩٩٧/١/٣٠)ز کاتژمێر (١١:٥٥) دەقیقەی پێش نیوەڕۆ.

## ٦٠- سوورەتی ( مومتەحینە )یە

## مەدەنییەو ( ١٣ ) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

تەوەرەی ئەم سوورەتی(مومتەحینە)ش دوو شتە: دۆستایەتیی لەبەرخوای‌بە هەق، خەشم و تووڕەییش هەر لەبەر خوا، سەرەتاکەشی بەگلەیەك لە (حاتەبی کوڕی ئەبی‌بەلتەعە) دەست پێ‌ئەکات،ئەوەدەمە کە نامەکەی بۆخەڵکی‌مەککە نووسی وتێیدا ئاماژەی کردبوو کە: پەیامبەر ﷺ ئەیەوێ سوپایەکتان بۆ ڕێك بخاو بێتە سەرتان..!! باس لەوکەسانە ئەکات کە خەڵکانی‌دوژمن و نەیاری خوایان خۆش ئەوێ، بۆئەوەیش بە باوەڕدارانی ئیبراهیم عليه السلام و گەلەکەی‌ئیبراهیم, نموونەیەك دێنێتەوە,بەو مەبەستە کە قورەیش چاویان لێ‌بکەن و،بزانن: چۆن ئەوانە بۆخوا خۆیان یەکلاکردەوەو لەهەمووبت وبتپەرستێك بەخەیان هەڵتەکاند، لەگەڵ نیشاندانی شێوەی هەڵس وکەوتکردن لەگەڵ ئەوخاوەننامانەدا کە جەنگ ودژایەتی موسڵمانان ناکەن، یان لە گەڵ ئەوانەیاندا خەریکی پیلانگێڕانن بە دژی موسڵمانەکان، ئینجا باسی ئەوژنە موسڵمانانە دەکات کە کۆچیان بۆمەدینە کرد. کۆتاییشی بەوەدێت کە: موسڵمانان دەبێ هەردەم بێدارو وشیاربن , و ناحەزان و دوژمنانی دینی‌خوا نەکەنە پشتیوان وجێگەی متمانەو ڕازو نیازی خۆیان, بەتایبەتی جوولەکەو هاوڕازەکانیان.

### مەبنە دۆسی دوژمنی خواو دوژمنی خۆتان:

﴿بسم الله الرحمن الرحيم * [1] يا أيها الذين آمنوا لا تتخذوا عدوى وعدوكم أولياء﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! دوژمنی من ودوژمنی خۆتان مەگرنە دۆست وخۆشەویست ,چونکە نیشانەی ئیمان و بڕوای ڕاستەقینە ئەوەیە کەناحەزودوژمنانی دینی خواتان خۆش نەوێت ﴿تلقون إليهم بالمودة﴾ وکەخۆشەویستیان بدەنێ بەئاگادارکردنیان لە نهێنی و ئەسراری خۆتان!. (قورتوبی) ئەڵێ: (من كثر تطلّعه على عورات المسلمين و ينبه عليهم ويعرّف عدوهم بأخبارهم لم يكن بذلك كافرا إذا كان فعله لغرض دنيوى، واعتقاده على ذلك سليم، كما فعل حاطب حين قصد بذلك إتخاذ اليد، ولم ينو الردة عن الدين). بەرگی:٩/جزمی/١٨/ل٤٨.﴿وقد كفروا بما جاءكم من الحق﴾ کە بێگومان ئەوان کافربوون بەوەی هات بۆتان لەهەق, واتە: کافربوون بەقورئان وئیسلام! ﴿يخرجون الرسول وإياكم ان تؤمنوا بالله ربكم﴾ جگە لەوەش لەمەککەدا ئێوەو پێغەمبەریان دەرکرد لە بەر ئیمانتان بەخوای پەروەردگارتان! ﴿إن كنتم خرجتم جهادا فى سبيلى وابتغاء مرضاتى﴾ ئەگەر ئێوە لەمەککەدا دەرچوون بۆ جیهاد لە ڕێ‌مندا و, بە نیازی بەدەست هێنانی ڕەزامەندی من, دۆستایەتی دوژمنی من وخۆتان مەکەن ﴿تسرون إليهم

الجزء الثامن والعشرون | سورة الممتحنة

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّخِذُوا۟ عَدُوِّى وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَآءَ تُلْقُونَ
إِلَيْهِم بِٱلْمَوَدَّةِ وَقَدْ كَفَرُوا۟ بِمَا جَآءَكُم مِّنَ ٱلْحَقِّ يُخْرِجُونَ ٱلرَّسُولَ
وَإِيَّاكُمْ أَن تُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ رَبِّكُمْ إِن كُنتُمْ خَرَجْتُمْ جِهَٰدًا فِى سَبِيلِى
وَٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِى تُسِرُّونَ إِلَيْهِم بِٱلْمَوَدَّةِ وَأَنَا۠ أَعْلَمُ بِمَآ أَخْفَيْتُمْ
وَمَآ أَعْلَنتُمْ وَمَن يَفْعَلْهُ مِنكُمْ فَقَدْ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴿١﴾ إِن
يَثْقَفُوكُمْ يَكُونُوا۟ لَكُمْ أَعْدَآءً وَيَبْسُطُوٓا۟ إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ وَأَلْسِنَتَهُم
بِٱلسُّوٓءِ وَوَدُّوا۟ لَوْ تَكْفُرُونَ ﴿٢﴾ لَن تَنفَعَكُمْ أَرْحَامُكُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُكُمْ
يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَفْصِلُ بَيْنَكُمْ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٣﴾ قَدْ
كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِىٓ إِبْرَٰهِيمَ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ إِذْ قَالُوا۟ لِقَوْمِهِمْ
إِنَّا بُرَءَٰٓؤُا۟ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا
وَبَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةُ وَٱلْبَغْضَآءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَحْدَهُۥٓ إِلَّا
قَوْلَ إِبْرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ لَأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ وَمَآ أَمْلِكُ لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ
رَّبَّنَا عَلَيْكَ تَوَكَّلْنَا وَإِلَيْكَ أَنَبْنَا وَإِلَيْكَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٤﴾ رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا
فِتْنَةً لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَٱغْفِرْ لَنَا رَبَّنَآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٥﴾

٥٤٩

﴿بالمودة﴾ كه نهێنیەكانتانیان به دزی بدەنێ له بەر خۆشەویشتی,وەك نامەكەی (حاتب) ﴿وانا اعلم بما أخفيتم وما اعلنتم﴾ لەكاتێكا من زاناترم بەوەی شاردووتانەتەوەو بەوەیش ئاشكراتان كردووە ﴿ومن يفعله منكم﴾ هەركەسێكتان ئەوكارە بكات ﴿فقد ضل سواء السبيل﴾ ئەوە بەیەقین ڕێی ڕاستیی ونكردووە وسەری لێشێواوە ﴿[2] إن يثقفوكم يكونوا لكم اعداء﴾ ئەگەر ئێوەیان گیربێ دەبنە دوژمنتان و شەڕتان پێدەفرۆشن ﴿ويبسطوا إليكم ايديهم والسنتهم بالسوء﴾ و دەستدرێژدەكەن بۆتان بەكوشتن ودیلكردن و,هەروا زمانیشیان بەجنێو ﴿وودوا لو تكفرون﴾ پێیانخۆشە ئێوەیش وەك خۆیان كافرو بێبڕوا بن!.پاشان دەچێتە سەر ئەوە كەنابێت مرۆڤ لەبەرخاتری ماڵ ومنداڵ دەست لەبەرنامەو ئایینی خوا هەڵبگرێ: ﴿[3] لن تنفعكم ارحامكم ولا أولادكم﴾ هەرگیز نە خزمانتان و نە منداڵەنتان سوودتان پێناگەیەنن و فریاتان ناكەون، لەڕۆژی قیامەتدا , كە ئێوە لە بەرئەوان دۆستایەتیان دەكەن ﴿يوم القيامة يفصل بينكم﴾ لەڕۆژی قیامەتدا خوا لێكتان جیائەكاتەوە(بڕوادارو بێ بڕوا)هەركەسە ئەنێرێ بۆجێگای شیاو بەخۆی ئەگەرچی كەس وكاریشتان بن ﴿والله بما تعملون بصير﴾ وخوا بینایە بەوەی ئەیكەن، واتە:هیچی لێناشارێتەوە.

## چاو له ئیبراهیم و پەیڕەوانی بكەن:

ئینجا بۆئەوەی موسڵمانەكان پتر لە دۆستایەتی بێباوەڕان بتەكێنەوە، خوا باسێكی ئیبراهیم وشوێنكەوتووەكانیانی بۆ ئەكات، بۆ ئەوە تێبگەن ئەوان چۆن خۆیان یەكلا كردبوویەوە بۆخوا: ﴿[4] قد كانت لكم اسوة حسنة فى إبراهيم والذين معه﴾ بە ڕاستی بۆ ئێوە هەیە ئەی ئیمانداران! لە ئیبراهیم ولەوانەی بڕوایان هێنابوو لەگەڵیا, سەرمەشقییەكی چاك و جوان. جا دەبێ ئێوەیش (ئەی بڕوادارەكان!) لەوان چاو بكەن وخۆتان لەبتەكان و لەوخزمە داروو بەردپەرستانە بەدوور بگرن وتەنها خواتان خۆش بوێ ﴿إذ قالوا لقومهم إنا برءؤا منكم ومما تعبدون من دون الله﴾ كاتێ بەقومە كافرەكەیانیان وت: بەڕاستیی ئێمە بێزارو بەریین لەخۆتان و لەوبتانە- لەجیاتی خوا- ئەیانپەرستن ﴿كفرنا بكم﴾ وبێباوەڕین پێتان ﴿وبدا بيننا وبينكم العداوة والبغضاء أبدا﴾ وە بەهەمیشە دوژمنایەتیی و ڕكەبەرایەتیی لەنێوانماندا پەیدابووە ﴿حتى تؤمنوا بالله وحده﴾ تا باوەڕ بەخوای تاك وتەنیا دێنن و هاوبەشی بۆدانانێن ﴿إلا قول إبراهيم لأبيه لأستغفرن لك﴾ لەوانەداچاو لەئیبراهیم بكەن، ئەو وتەیەی نەبێ كە بە باوكیخۆیگوت: داوای لێخۆشبوونت بۆ دەكەم لە خوا, ئەوبەڵێنەشی هەر لەبەر ئەوەبووكە پێشتر هیواو ئومێدێكی هەبوو بڕوا بێنێ، بەڵام كەدەركەوت بێ باوەڕوو دوژمنی خوایە، یەخەی لێهەڵتەكان و بێزاری خۆی دەربڕی، وەك لەسوورەتێكی تردا ئەمەی ڕاگەیاندووەو دەفەرمووێ: (وماكان استغفار أبراهيم لأبيه إلا عن موعدة وعدها إياه فلما تبين له أنه عدو لله تبرأ منه) ٩/١١٤ ﴿وما املك لك من الله من شئ﴾ ئەگەرچی من دەسەڵاتی هیچ شتێكیشم بۆت نیە لایخوا ﴿ربنا عليك توكلنا﴾ ئەی پەروەردگاری ئێمە! هەربە تۆ پشتمان بەستووە ﴿واليك انبنا﴾ هەربۆ لای خۆیشت گەڕاینەوە ﴿واليك المصير﴾ وسەر ئەنجامیش هەربۆلای تۆیە، واتە:وا ئێمە بەتەواویی خۆمانمان دایە دەستی تۆ، پەنا هەرپەنای تۆیە، دەستمان لەخزم وكەس و كارمان هەڵگرت لەبەرخاتری تۆ، دەساتۆیش چاودێرمان بە. جاكەوابوو ئەی موسڵمانان! ئەبێ ئێوەیش خۆتان یەكلابكەنەوە، هاوكاریی و تێكەڵییان مەكەن، نهێنیی و ڕازونیازی موسڵمانانیان بۆمەنێرن بەنامەو بەهەرشتێكی تر ﴿[5] ربنا لا تجعلنا فتنة للذين كفروا﴾ ئەیپەروەردگارمان! مەمانكە بەمایەی تاقیكردنەوە بۆ بێباوەڕان، واتە: كەئەزیەتمان بدەن ولەئایین لامان بدەن

﴿واغفر لنا ربنا إنك انت العزيز الحكيم﴾ لیمان خۆش ببە ئەی پەروەردگارمان! لەهەر کەم وکورتییەك بەسەرمانا هاتبیٚ، بەراستی تەنها ئەتۆی دەسەڵاتداری کارجوان وکارزان.

بۆجارێکی تر هانی موسڵمانەکان دەدات کە: چاو ببڕنە (ئیبراهیم) و ئەوانەی لەگەڵیابوون، بۆیە ئەفەرمویٚ: ﴿[6] لقد كان لكم فيهم اسوة حسنة﴾ سویٚند بیٚ بەخوا لەسەر گوزەشتەکەی ئیبراهیم و هۆزە داپڕاوەکەیدا سەرمەشقیٚکی چاك و جوان هەیە بۆتان ،هەقە چاویان لیٚبکەن و هەر بیلیٚن و بیلیٚنەوە ﴿لمن كان يرجو الله واليوم الآخر﴾ ئەم سەرمەشقییەش بۆکەسیٚکە هیواو ئومیٚدی بەخزمەتگەیشتنی خواو،هاتنی رۆژی دوایی ببیٚ ﴿ومن يتول فإن الله هو الغني الحميد﴾ وهەرکەسیٚك پشت هەڵبکا لەبڕواهیٚنان و بەتەمای رۆژی دوایی نەبیٚت،جا بیٚگومان خوا بیٚ نیازو و سوپاسکراوە لەهەموولایەکەوە، پیٚویستی بەبڕواهیٚنان و سوپاسی کەس نییە.

**بەشکو لەناو ئیٚوەو نەیارەکاندا خوا دۆستایەتی دامەزریٚنیٚ:**

کاتیٚ خوای دلۆڤان لە ئایەتەکانی پیٚشوودا ریٚی لەمسوڵمانەکان گرت، دۆستایەتیی وئاشنایی لە گەڵ خزمانی خراپکارو بیٚبڕوایانیان بکەن، ئەوانیش لە بەر خوا- زۆر بە پەرۆشەوە -چوونە ژیٚربیٚ، ئەگەرچی قورس و گرانیش دەکەوت لە سەریان؛ جاخوا بۆ دڵخۆشکردنیان ئەفەرمویٚ: ﴿[7] عسى الله أن يجعل بينكم وبين الذين عاديتم منهم مودة﴾ دڵنیابن کە خوا خۆشەویستی دەخاتە نیٚوان ئیٚوەوئەوانەوە دوژمنایەتیتان لەگەڵکردوون،جا ئەوکاتە گشت دەبنە برا.بەڵیٚ هەروایش دەرچوو،چونکە لەفەتحی (مەککە)دا خەڵکیٚکی زۆر لەوانە بڕوایان هیٚناوموسڵمان بوون ﴿والله قدير﴾ وخواش بەتوانایە ، ئەتوانیٚ هەموو ئاڵ و گۆڕیٚ بکات ﴿والله غفور رحيم﴾ وەخوا لیٚخۆشبووی میهرەبانە، پیٚغەمبەر ﷺ دەفەرمویٚ: ((أحبب حبيبك هوناًما، فعسى أن يكون بغيضك يوماًما، وأبغض بغيضك هوناًما، فعسى أن يكون حبيبك يوماًما)). تحفة الأحوذي:١٣٣/٦ .واتە: ئەوەندە دۆستایەتی لەگەڵ خەڵکدا بکە، بەشی حاڵەتی نەیاریی بمیٚنیٚتەوە، چونکە دەکریٚ رۆژیٚ ئەو کەسە ئەمڕۆ دۆستە، ببیٚتە دوژمن و ناحەزت، هەر ئەوەندەش رکەبەرایەتی لەگەڵ بکە(ئەگەر کردت) بەشی ئاشتی بیٚڵەرەوە، چونکە دەگونجیٚت رۆژیٚ ببیٚتەوە بەئاشناو دۆستت.مەبەست ئەوەیە دۆستایەتی ونەیاریی لە گەڵ خەڵکدا دەبیٚ لە سنووری خۆیدا بیٚ

**ئەوانە کەدژایەتییان لەگەڵ نەکردوون، ئیٚوەدەتوانن دۆستایەتییان بکەن:**

پاش ئەوەیخوا ریٚی لە دۆستایەتی گرت لەگەڵ خزمانی خراپکارو دوژمن بەخوا لەسەرحیسابی ئیسلام، لەم ئایەتەیشداپترتیشك دەخاتەسەر ئەو مەسەلەیەو، خەڵکی شەڕفرۆش وناپاك ، لە گەڵ خەڵکی بیٚدەنگ وئاژاوە نەگیٚڕ جیادەکاتەوەوفەرمووی: ﴿[8] لا ينهاكم الله عن الذين لم يقاتلوكم فى الدين ولم يخرجوكم من دياركم أن تبروهم

الجزء الثامن والعشرون — سورة الممتحنة

لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِيهِمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ
وَمَن يَتَوَلَّ فَإِنَّ اللَّهَ هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ ﴿٦﴾ ۞ عَسَى اللَّهُ أَن يَجْعَلَ
بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ الَّذِينَ عَادَيْتُم مِّنْهُم مَّوَدَّةً وَاللَّهُ قَدِيرٌ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ
﴿٧﴾ لَّا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم
مِّن دِيَارِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ
﴿٨﴾ إِنَّمَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ قَاتَلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَأَخْرَجُوكُم
مِّن دِيَارِكُمْ وَظَاهَرُوا عَلَىٰ إِخْرَاجِكُمْ أَن تَوَلَّوْهُمْ وَمَن يَتَوَلَّهُمْ فَأُولَٰئِكَ
هُمُ الظَّالِمُونَ ﴿٩﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا جَاءَكُمُ الْمُؤْمِنَاتُ
مُهَاجِرَاتٍ فَامْتَحِنُوهُنَّ اللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَانِهِنَّ فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَاتٍ
فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى الْكُفَّارِ لَا هُنَّ حِلٌّ لَّهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ وَآتُوهُم
مَّا أَنفَقُوا وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ أَن تَنكِحُوهُنَّ إِذَا آتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ
وَلَا تُمْسِكُوا بِعِصَمِ الْكَوَافِرِ وَاسْأَلُوا مَا أَنفَقْتُمْ وَلْيَسْأَلُوا مَا أَنفَقُوا
ذَٰلِكُمْ حُكْمُ اللَّهِ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١٠﴾ وَإِن فَاتَكُمْ
شَيْءٌ مِّنْ أَزْوَاجِكُمْ إِلَى الْكُفَّارِ فَعَاقَبْتُمْ فَآتُوا الَّذِينَ ذَهَبَتْ
أَزْوَاجُهُم مِّثْلَ مَا أَنفَقُوا وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي أَنتُم بِهِ مُؤْمِنُونَ ﴿١١﴾

يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ ٥٥٠

وتقسطوا إليهم﴾ خوا ڕێتان ناگری لەو کافرو بێباوەڕانەی جەنگیان نەکردوون لە ئاییندا ,و لە ماڵ وزێدی خۆتان دەریان نەکردوون – وەك خوزاعە- کەچاکەیان لەگەڵ بکەن و مامەڵەیان لە گەڵ بەکەن بە دادگەریی ﴿إن الله يحب المقسطين﴾ بەڕاستیی خوای دادپەروەر , خەڵکانی دادپەروەری خۆش دەوێ.

**دۆستی لەگەڵ شەر فرۆشاندا ناکرێ:**

﴿٩ إنما ينهاكم الله عن الذين قاتلوكم في الدين﴾ خوا تەنیا ڕێتان لەوانە لێ دەگرێت کوشتاریان لێکردوون ﴿وأخرجوكم من دياركم﴾ و لە زێدو ماڵی خۆتان دەریانکردوون ﴿وظاهروا على إخراجكم أن تولوهم﴾ و وپشتیوانی یەکتریانکرد لە سەر وە دەرنانتان کە: دۆستایەتیان بکەن ﴿ومن يتولهم فأولئك هم الظالمون﴾ وهەر کەسێك دۆستایەتیان بکا، ئەوەئەوانە ستەمیان کردووە بەوکارەیان, چونکە دۆستایەتیی وپشتیوانی لە نەیارانی دیندیخوا دژ بە موسڵمانان گەورەترین تاوانە.

**ژنی موسڵمان بە موشریك بەشوو نادرێ، موشریکیش بە موسڵمان ناشێ:**

﴿١٠ يا أيها الذين آمنوا إذا جاءكم المؤمنات مهاجرات﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! ژنەباوەڕدارەکان کەلەمەککەوە کۆچیان کرد بۆلای ئێوە لە مەدینە ﴿فامتحنوهن﴾ جا بۆخۆتان تاقییان بکەنەوە ,بزانن ڕاست ئەکەن لەبڕواکەیاندا؟ لەبەر ئیسلام هاتوون، یان لەمێردوکەس وکاریان هەڵاتوون؟!. لەپەیماننامەکەی (حودەیبیە)داهاتبوو:ئەو کەسەی لەمەککەوە دێت بۆلای موسڵمانەکان، نابێ وەریبگیرێن، بەڵام ئەوانە لەلای موسڵمانەکانەوە بچن بۆلای کافرەکان، ئەوان دەتوانن وەریان بگرن ولایخۆیان بیانهێڵنەوە. جا پاش ماوەیەك ئافرەتێکی (أم كلثوم) ناو لەمەککەوە هات بۆمەدینە، پاشان دووبرای هاتن بەدوایدا تا بەپێی مەرجەکان بیبەنەوە، پەیامبەریش ﷺ فەرمووی: ئەومەرجانە تەنها بەرامبەر بەپیاوانە، ژنان ناگرێتەوە.. جاپاش ئەوە خوا ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە، ئەوسا ئیتردوای ئەوە سوێندی ژنانیان ئەدا کەلەمێردیی وکەس و کاری نەتۆراوە وتەنها لەبەرخاتری ئاییی ئیسلام هاتووە ﴿الله أعلم بإيمانهن﴾ خواش زاناترە بەئیمانەکەیان، ئەوچاك ئەزانێ چۆن وبۆچی ئیمانیان هێناوەو کۆچیان کردووە؟ ﴿فإن علمتموهن مؤمنات﴾ جا ئەگەر زانیتان باوەڕدارن و , تەنها لەبەر ئیسلام هاتوون ﴿فلا ترجعوهن إلى الكفار﴾ مەیانگێڕنەوە بۆلای مێردەکافر و بێبڕواکانیان ﴿لا هن حل لهم﴾ چونکە ئەوژنانە حەڵاڵنین بۆئەو پیاوەکافرانە ﴿ولاهم يحلون لهن﴾ و ئەوپیاوە بێبڕوایانەش حەڵاڵنین بۆئەو ژنە بڕوادارانە، واتە: ژنیموسڵمان دەبێ تەنها بۆپیاوی موسڵمان بێت ﴿وآتوهم ما أنفقوا﴾وە بدەن بە مێردەکافرەکانیان ئەوەی خەرجیانکردووە بۆئەم ژنانە, بۆئەوەی تەنها ژنەکانیان لەدەست دەرچووبێت ﴿ولا جناح عليكم أن تنكحوهن إذا آتيتموهن أجورهن﴾ گوناحتان لە سەر نیە کە ئەو ژنانە نیکاح بکەن لە خۆتان ,کاتێ مارەییەکەیانتان دانێ، چونکە بەموسڵمان بوونەکەیان پەیوەندی ژن ومێردییان لەگەڵ ئەواندا ئەپچڕێ، پاش تەواو بوونیعیدەش –ئەگەر پێشتر شوویان کردبوو– ئەتوانن مارەیان بکەن ﴿ولا تمسكوا بعصم الكوافر﴾ و ئێوەش ژنە کافرەکان ڕامەگرن، واتە: ئەو ژنانە کەلە (دار الكفر)دا بە جێماون و موسڵمان نەبوون، وا دابنێن هەرژنتان نەبوون، کەوابوو ئێستا ئەتوانن خوشکیان، یان پووریان مارەبکەن لە خۆتان ﴿واسئلوا ما أنفقتم﴾ ئێوەش (ئەی مێردە موسڵمانەکان)! داوای ئەومارەییەیبکەن –لەوکەسەی مارەیکردووە– مەسرەفتانکردووە بۆیان ﴿وليسألوا ما أنفقوا﴾ و بائەوانیش داوای بکەن چیان خەرجکردووە, واتە: ئەگەرپیاوێك خۆی موسڵمان بوو وکۆچیکرد و, ژنەکەشی بەکافری مایەوە وپاشان مێردیکرد، دەبێ مارەییەکەی بگەڕێتەوە بۆئەم پیاوە موسڵمانەی، وەئەگەر ژنێك هیجرەتیکردو موسڵمان بوو–پاش

عیددەش- مێردی کردەوە، دەبێ مارەییەکەی بگێڕێتەوە بۆمێردە کافرەکەی ﴿ذلكم حكم الله يحكم بينكم﴾ ئائەوە حوکم و بڕیاری خوایە, حوکم وبڕیاردەدا لە نێوانتاندا سەبارەت بە ژن وپیاوی موسڵمان وکافر ﴿والله عليم حكيم﴾ خواش خوایەکی زانای دانایە ﴿[11] وإن فاتكم شئ من ازواجكم إلى الكفار﴾ ئەگەر یەکێ لە ژنەکانتان لە دەستان دەرچووو گەڕانەوە بۆ لای بێباوەڕەکان و، ئەوانیش مارەیانکردو مارەییەکەیان بۆ ڕەد نەکردنەوە ﴿فعاقبتم﴾ جائێوەش تۆڵەتان لێکردنەوە, واتە: جەنگ لەنێوان ئێوەو کافراندا بەرپابوو و بەغەنیمەت شتێکتان لێگرتن ﴿فآتوا الذين ذهبت ازواجهم مثل ما انفقوا﴾ جا لەودەستکەوتە بدەنە ئەوانەی ژنەکانیان ڕۆیشتوون,وێنەی ئەوەی خەرجیانکردووە لە مارەییەکەدا ﴿واتقوا الله الذى انتم به مؤمنون﴾ وە لەوخوایە بترسن ئیمان وباوەڕتان پێی هەیە، وبڕیارەکانیشی سەرجەم جێبەجێ بکەن.

الجزء الثامن والعشرون — سورة الصف

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَىٰٓ أَن لَّا يُشْرِكْنَ
بِٱللَّهِ شَيْـًٔا وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ وَلَا يَأْتِينَ
بِبُهْتَٰنٍ يَفْتَرِينَهُۥ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ وَلَا يَعْصِينَكَ
فِى مَعْرُوفٍ فَبَايِعْهُنَّ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُنَّ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ
(١٢) يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَوَلَّوْا۟ قَوْمًا غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ
قَدْ يَئِسُوا۟ مِنَ ٱلْءَاخِرَةِ كَمَا يَئِسَ ٱلْكُفَّارُ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلْقُبُورِ (١٣)

ترتيبها ٦١ — سُورَةُ ٱلصَّفِّ — آياتها ١٤

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ
(١) يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ (٢)
كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُوا۟ مَا لَا تَفْعَلُونَ (٣) إِنَّ
ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِهِۦ صَفًّا كَأَنَّهُم
بُنْيَٰنٌ مَّرْصُوصٌ (٤) وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَٰقَوْمِ لِمَ
تُؤْذُونَنِى وَقَد تَّعْلَمُونَ أَنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ فَلَمَّا
زَاغُوٓا۟ أَزَاغَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمْ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ (٥)

٥٥١

**بەیعەتی ژنان بە پێغەمبەر:**

کاتێ پەیامبەر ﷺ مەککەی ئازاد کرد، پیاوان دەهاتن پەیمانیان لەسەرفیداکاری بۆئیسلام لە گەڵ دەبەست، ئینجا سەبارەت بەوژنانەش موسڵمان دەبوون دەهاتن ئەم ئایەتەهات و فەرمووی: ﴿[12] يا ايها النبى إذا جاءك المؤمنات﴾ ئەی پەیامبەر!کاتێ ژنانی باوەڕدار هاتنەلات ﴿يبايعنك﴾ بەیعەتت پێ بکەن، جاتۆش لەسەر ئەم شەش خاڵە گرنگە: ﴿علىألايشركن بالله شيئا﴾ یەکەم: لە سەر ئەوەیهیچ شتێ نەکەنە هاوبەشی خوا، وبەتاك وتەنیای بزانن ﴿ولا يسرفن﴾ دووەم: دزی نەکەن ﴿ولا يزنين﴾ سێیەم: زینا نەکەن ﴿ولا يقتلن اولادهن﴾ چوارم: منداڵەکانی خۆیان نەکوژن و زیندە بەچاڵیان نەکەن وەك سەردەمی نەزانیی ﴿ولا ياتين ببهتان يفترينه بين ايديهن وارجلهن﴾ پێنجەم: هیچ بۆختانێك نەکەن لە نێوان دەست و پێی خۆیاندا, واتە: منداڵی خەڵکی نەکەنە منداڵی خۆیان، لە سەردەمی نەفامیدا هەرژنێك ترسی بووبا مێردەکەی - لەبەرئەوە منداڵی نابێت دەری بکا- دەچوو منداڵی دۆزراوەی دەهێناودەیکرد بەمنداڵی خۆیی و بە مێردەکەی دەگوت ئەمە لەتۆیە.. ئینجا خوای گەورە بەو ئایەتە ئەو کارەی لێ قەدەغە کردن. ﴿ولا يعصينك فى معروف﴾ شەشەم: لە هەموو کارێکی چاکەدا سەرپێچیی ونافەرمانێت نەکەن ﴿فبايعهن﴾ ئەوسا تۆش بەیعەتیان لێوەرگرە. بەڵێ.. لە ڕۆژی دووەمی ئازادکردنی مەککەدا، ژنانیش پاش هاتنی پیاوان ,پۆل پۆل دەهاتنە (صەفا)و موسڵمان دەبوون، پەیامبەریش ﷺ بەزمان - نەك بەدەسخستنە ناودەس- لەسەر ئەو خاڵ و مەرجانەی سەرەوە- پەیمانی لێوەر دەگرتن، شیاوی باسە پێغەمبەر ﷺ بەهیچ شێوەیەك دەستی لە دەستی ژنی نامەحرەم نەکەوتووە. فتح الباری: ٨/٥٠٤ ﴿و استغفر لهن الله﴾ وەلەخوای دلۆڤان داوای لێخۆشبوونیان بۆبکە ﴿إن الله غفور رحيم﴾ بەڕاستیی خوا خوایەکی گوناهپۆشی میهرەبانە ﴿[13] يا ايها الذين آمنوا لا تتولوا قوما غضب الله عليهم﴾ ئەی

ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! دۆستایەتی کۆمەڵێ مەکەن (مەبەست لە جوولەکەیە) خوا غەزەبی لێگرتوون, واتە: نە بەنامەو نەبەکاغەز نووسین، و نەبەهیچ جۆرێکی‌تر هاوکارییان مەکەن ﴿قد یئسوا من الآخرة﴾ بەراستی نائومێدو بێهیوا بوون لەقیامەت ,چونکە باوەڕیان پێی نیە ﴿کما یئس الکفار من أصحاب القبور﴾ وەك بێ باوەڕەکان لەمردووی گۆڕەکان بێ ئومید بوون زیندوو ببنەوە، ئەوانەیش بەهیچ شێوەیەك بەهیواو ئومێدی هاتنی قیامەت و پاداشتی نین، کەوابوو دووربگرن لێیان ومەیانکەنە پشتیوان و دۆستی خۆتان و, ڕازو نیازی موسوڵمانانیان لامەدرکێنن.

لە شەوی (٢٣/٢٢)ی ڕەمەزانی (١٤١٧)ك بەرامبەر بە (١٩٩٧/٢/٢/١) لە (مەریوان), کاتژمێر ٤٠،٧/ لەنووسینی تەفسیری ئەم سوورەتی(مومتەحینە) بوومەوە.

والحمد لله أولا وآ خرا، و صلی الله وسلم و بارك علی محمد وآل محمد.

*** *** ***

## ٦١- سورەتی ( صەف ـە
## مەدەنییەو ( ١٤ ) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

سوورەتی(صەف)یش وەك سوورەتەکانی تری مەدینە باسی هەندێ لە ئەحکام و کۆمەڵێ ڕێنمایی ئەکات، ئەیشتوانی بڵێیت بە شێوەیەکی گشتیی و سەرەکیی باسی بەجەنگ هاتن دەکات لەگەڵ ناحەزان و دوژمنانی دینی خوادا، وە فیداکاریی‌و هەوڵ و تێکۆشان بۆ سەربڵندیی بەرنامە و ئایینی خوای گەورەو بەرزکردنەوەی وشەی پیرۆزی ئەو ئەکات، وە هەروەها باسی تاکە بازرگانییەکی سەرکەوتوو دەکات لە دنیا ولە پاشە ڕۆژدا، کە ئەویش جیهاد کردنە لە ڕێی دینی خوای گەورەدا.. بەکورتی دەتوانین بڵێن تەوەرەی ئەم سوورەتە باسی هەڵنانی بڕوادارانە بۆ جەنگ و جیهاد، هەر بە ناوەکەشیا -کەپێی دەڵێن: سوورەی (صەف = ڕیزبوون) لەبەرەکانی جەنگدا- دیارە مەبەست پێی چیە. جا بەم شێوەش دەست پێ ئەکات: ﴿بسم الله الرحمن الرحیم* [1] سبح لله ما فی السموات وما فی الارض﴾ هەرچی لە ئاسمانەکان و لە زەویدایە, تەسبیحاتی خوا ئەکەن ,واتە: بەرزیی‌و بڵندیی‌و بێ خەوشیی خوا ئەڵێن، گەواهیی و شایەتی بۆ تاك وتەنیایی ئەدەن ﴿وهو العزیز الحکیم﴾ هەر ئەویشە دەسەڵاتداری کارجوان و کارزان ,بۆیەجێگەی خۆیەتی تەواوی بوونەوەر فەرمانبەردار و ملکەچی بن.

### قسەی بێکردەوە مەکەن:

﴿[2] یاأیها الذین آمنوا لم تقولون ما لا تفعلون﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! بۆ چی شتێ دەڵێن و ڕەفتاری پێناکەن؟ مەگەر ئێوە نەتانوت:ئەگەر بمانزانیبا چ کارێ بە لای خواوە زۆر باشە ئەمانکرد؟ کەچی کاتێ باسی گەورەیی ومەزنیی جیهاد کرا لای خوا ,هەندێکتان قسەکەی خۆتانتان شکاندو پێتان ناخۆش بوو (الدر المنثور): ١٤٦/٨ ﴿[3] کبر مقتا عند الله أن تقولوا مالا تفعلون﴾ خوا لە لای سەختە، کە شتێ بڵێن وکاری پێنەکەن؟ ﴿[4] إن الله یحب الذین یقاتلون فی سبیله صفا﴾ بێگومان خوا ئەو کەسانەی خۆش ئەوێ دەجەنگن لە پێناوی ڕێگای ئەودا بەیەك صەف و، یەك ڕیز ﴿کأنهم بنیان مرصوص﴾ وەك دیواری بینایەکی مەحکمی بە قوڕقوشم داڕێژراو، واتە: بەشێویەك دەجەنگن هەرگیز لەجێگەی خۆیاندا ناجوڵێن و سەنگەر چۆڵناکەن.

**قەومەکەی مووسا پێغەمبەر ﷺ ئازاری موسایان دا:**

پاش ئەوەی باسی جیهادیکرد، ئەوسا دێتە سەر کورتە باسێکی موساو عیسا ﷺ کە ئەوانیش هەوڵی زۆری یەکتاپەرستیان داو، فرمانیشیان بە جیهاد کرد، کەچی ئەوانیش لە لایەن گەلەکەیانەوە وەک تۆ ئەی پێغەمبەر ﷺ ئازار دران، و خۆشیانگرت ، بۆیە ئەفەرموێ: ﴿ وإذ قال موسى لقومه يا قوم لم تؤذونني ﴾ وەبیریان بێنە باسی موسا ئەی موحەمەد! ﷺ کاتێ کەبە هۆزو گەلەکەی خۆیگوت: ئەی هۆزی من! ئێوە بۆچی ئازاری دڵم ئەدەن؟ بە سەر پێچی کردنتان لە فەرمانەکانی خوا ﴿وقد تعلمون أني رسول الله إليكم ﴾ خۆ بێگومان دەشزانن کە من پەیامبەری خوام و نێرراوم بۆلای ئێوە ﴿فلما زاغوا أزاغ الله قلوبهم ﴾ جا کاتێ ئەوان لە هەق و ڕاستیی لایاندا، خوایش دڵ و دەروونی کلا کردن ، سەرگەردان و وێڵی دەشت و بیابان بوون ﴿والله لا يهدي القوم الفاسقين ﴾ و بەراستیی خوایش ڕێنوینی خەڵکی لە سنوور دەرچوو و نافەرمان ناکات، چونکە ئامادە یی یان تیا نیە بۆ ڕێنموونی.

**عیسا ﷺ مژدەی هاتنی پێغەمبەر دەدات:**

﴿ وإذ قال عيسى ابن مريم ﴾ وەبیریان بێنە کاتێ کەعیسای کوڕی مەریەم وتی: ﴿يا بني إسرائيل إني رسول الله إليكم جميعا ﴾ ئەی نەوەکانی یەعقوب! بێگومان من پێغەمبەرو نێرراوی خوام بۆلای ئێوە ﴿مصدقا لما بين يدي من التوراة ﴾ دەدانیش بەوتەوراتەدا دەنێم لە بەردەستمدایە ﴿ومبشرا برسول يأتي من بعدي اسمه أحمد ﴾ مزگێنیش بە هاتنی پەیامبەرێك دەدەم - کەپاش خۆم دێ - ناوی(ئەحمەد)ە، لە فەرمودەدا هاتووە کەیەکێ لە ناوەکانی ئەو پێغەمبەرە (ئەحمەد)ە ﷺ وەکو دەفەرموێ: ((إن لي أسماء: أنا محمد، وأنا أحمد، وأنا الماحي الذي يمحو الله به الكفر، و أنا الحاشر الذي يحشر الناس على قدمي، وأنا العاقب)) (متفق عليه): فتح الباري: ٦/٨٠٠ ومسلم: ٤/١٨٢٨. ﴿فلما جاءهم بالبينات ﴾ جا کاتێ عیسا یان موحەممەد بە موعجیزە ڕوونەکانەوە هات و پێڕاگەیاندن ﴿قالوا هذا سحرمبين ﴾ وتیان: ئەمە جادویەکی ئاشکراو نمایانە! ﴿ ومن أظلم ممن افترى على الله الكذب وهو يدعى إلى الإسلام ﴾ چ کەسێك هەیە لەوەستەمکارتر کە لە سەر خوا درۆ هەڵبەسێت، لە کاتێکدا بانگ بکرێت بۆ ئیسلامبوون وموسڵمان بوون؟! عیسا بانگی کردن و موژدەی هاتنی ئەو پێغەمبەرەی پێدان، کەچی وتیان ئەمە جادووە!! ﴿والله لا يهدي القوم الظالمين ﴾ وخواش ڕێنمایی گەل و هۆزی ستەمکار ناکات، چونکە شایستەی هیدایەت نیە.

الجزء الثامن والعشرون — سورة الصف

وَإِذْ قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا
لِّمَا بَيْنَ يَدَىَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَمُبَشِّرًۢا بِرَسُولٍ يَأْتِى مِنۢ بَعْدِى ٱسْمُهُۥٓ أَحْمَدُ ۖ فَلَمَّا
جَآءَهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ قَالُوا۟ هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٦﴾ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ
عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ وَهُوَ يُدْعَىٰٓ إِلَى ٱلْإِسْلَٰمِ ۚ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ
﴿٧﴾ يُرِيدُونَ لِيُطْفِـُٔوا۟ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفْوَٰهِهِمْ وَٱللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِۦ وَلَوْ كَرِهَ
ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٨﴾ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ
عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُشْرِكُونَ ﴿٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ هَلْ أَدُلُّكُمْ
عَلَىٰ تِجَٰرَةٍ تُنجِيكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿١٠﴾ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُجَٰهِدُونَ
فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١١﴾
يَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَيُدْخِلْكُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ وَمَسَٰكِنَ
طَيِّبَةً فِى جَنَّٰتِ عَدْنٍ ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٢﴾ وَأُخْرَىٰ تُحِبُّونَهَا ۖ نَصْرٌ
مِّنَ ٱللَّهِ وَفَتْحٌ قَرِيبٌ ۗ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُونُوٓا۟
أَنصَارَ ٱللَّهِ كَمَا قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ لِلْحَوَارِيِّـۧنَ مَنْ أَنصَارِىٓ إِلَى ٱللَّهِ ۖ
قَالَ ٱلْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ أَنصَارُ ٱللَّهِ ۖ فَـَٔامَنَت طَّآئِفَةٌ مِّنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ
وَكَفَرَت طَّآئِفَةٌ ۖ فَأَيَّدْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ عَلَىٰ عَدُوِّهِمْ فَأَصْبَحُوا۟ ظَٰهِرِينَ ﴿١٤﴾

سورة الجمعة ٥٥٢

**دەیانەوێ بە فووی دەمیان ئەم دینی خوایە بکوژێننەوە!:**

﴿[٨] یریـدون لیطفئـوا نـور الله بـأفواههم﴾ بێباوەڕەکـان ئەیانـەوێ بـەفووو، (بەقاڵـەی دەم)یـان نـورو رووناکی بەرنامەی خوا بکوژێننەوە!! ﴿والله متم نوره﴾ لە کاتێکدا خوا خۆی تەواو کەری نووری ئایینی خۆیەتی ﴿ولو کره الکافرون﴾ ئەگەرچی کافرو بێ بڕوایانیش پێیان ناخۆش بێت، واتە: خوا خۆی ئەم ئایینی خۆیە هەر سەر ئەخات, هەرچەندە لە هەموو لایەکەوە دوژمنان بیانەوێ کپی بکەنەوەو لیخنی بکەن.

**ئیسلام بەسەر گشت دینەکاندا سەردەکەوێ:**

﴿[٩] هو الذی أرسل رسوله بالهدی ودین الحق﴾ خو ئەو زاتەیە کە پەیامبەرەکەی خۆی(محمد) بەقورئانێکی ڕێنموونیکارو ئایینێکی ڕاست ورەوانەوە نارد ﴿لیظهره علی الدین کله﴾ بۆ ئەوە بەسەر تەواوی ئایینەکاندا سەری بخات ﴿ولو کره المشرکون﴾ ئەگەرچی موشریك و هاوبەش پەیداکەرانیش پێیان ناخۆش بێ و,هەوڵی کوژانەوەی بدەن.

**بچنە جیهاد لە سزاو ئازار رزگار دەبن:**

ئینجا موسڵمانان هەڵئەنێت بۆ جیهادو دڵیان خۆش ئەکات، بۆیە ئەفەرموێ: ﴿[١٠] یاأیهاالـذین آمنـوا هل أدلکم علی تجارة تنجیکم مـن عـذاب الیم﴾ ئـەی ئەوانـەی باوەڕتـان هێنـاوە! ئایارێگای بازرگانیـەکتان نیشان بـدەم لـە سزایەکی ئێش پێگەیەنەری دۆزەخ ڕزگارتان بکات؟: ﴿[١١] تؤمنون بالله ورسوله﴾ باوەڕبکەن بەخواو بەپێغەمبەرەکەی ﴿وتجاهدون فی سبیل الله بأموالکم وانفسکم﴾ وە بە ماڵ و بە گیانتـان – لـە پێنـاوی سەرخستنی ڕێبازی خوادا– جیهاد بکەن ﴿ذلکم خیر لکم إن کنتم تعلمون﴾ ئەو بڕواو جیهادەتان لەهەموو شتێك بۆتـان باشترو چاکترە, ئەگەر بـزانن ﴿[١٢] یغفـر لکـم ذنـوبکم﴾ ئەگـەر واتـانکرد, ئەوسا خـواش هەڵـەو گوناهـەکانتان ئەبەخشـێ و چاوپۆشییان لێئـەکات ﴿ویـدخلکم جنات تجری من تحتها الانهار﴾ ولـە قیامەتدا ئەتانخاتـە نـاو چەندین باخـاتی بەهەشتەوە کەچۆم ورووبـار لـەژێر درەختەکانیـەوە دەردەچێت ﴿ومسـاکن طیبـة فـی جنـات عـدن﴾ و لـەناو چـەندان کۆشك و خانووی رازاوەو پاك و خاوێنشدا لە بەهەشتی هەتا هـەتایی ونەبڕاوەدا نیشتەجێتان دەکات ﴿ذلك الفوز العظیم﴾ هەر ئەوەیە سەرفرازی گەورەو بێوێنە. تائێرە باسی پاداشتی دوا ڕۆژ بوو، ئینجا هەندێکیشی هەر لەدونیادا پێتان دەبەخشێت, وەك ئەفەرموێت: ﴿[١٣] واخری تحبونها﴾ وبەهرەیەکی ترحەزتان پێیە لە دنیادا بتانداتێ ﴿نصر من الله وفتح قریب﴾ ئەویش یارمەتیدان و سەرخستنە لـە لایـەن خـواوە، وە فـەتح و پیرۆزیـەکی نزیکە، ,واتە:ئازاد کردنی مەککەیە، یان هەر وڵاتێکی تری پڕ لە خێر بۆ موسڵمانان ﴿وبشر المؤمنین﴾ ومژدەی ئەوەش بدە بە باوەڕدارەکان, تـا پشت ئەسـتوور بن لەسـەر ئەو بەڵێنـە.. بـەڵێ هەروابوو،چونکە لـە ماوەیـەکی زۆرکـەمدا خـوای باڵادەست ئـاڵای ئیسلامی پیرۆزی بەسەر زۆرێ لە وڵاتاندا بـەرز کردەوە،ئەوەبوو ئیسـلام بۆ چـەند سـەدەیەك کاروبـاری سیاسیی و، ئـابووریی و، کۆمەڵایـەتیی و، یاسـایی گـەلانی زۆر بەسـەرکەتووانە بـەڕێ ئـەکرد، تـارۆژێ خـەڵك دەسـتی لەئیسـلام نەکێشابوویەوە، بەڵام کاتێ دەستیان لەئیسـلام هـەڵگرت و، گەڕانەوە ژێـر ئـاڵای ئـەم و ئـەو, دەرەنجـام دۆڕانـدیان و ڕیسواو ژێر دەستکران.

**پشتیوانی لەم ئیسلامە بکەن:**

﴿[١٤] یا أیها الذین آمنوا کونوا انصار الله﴾ ئـەی ئەوانـەی باوەڕتـان هێنـاوە! ببنەپشتیوان و یارمەتیدەری دینی خوا ﴿کما قال عیسی بن مریم للحواریین﴾ وەك عیسای کوڕی مەریەم بە حەوارییەکانی هاوەڵی گوت: ﴿من أنصاری

إلى الله﴾ کێ بۆ گەیاندنی ئایینی خوا یارو یاوەرمە؟ ﴿قال الحواریون نحن انصار الله﴾ حەوارییەکانیش وتیان: ئێمە یارمەتیدەری ئایینی خواین، هەموو کات فیدایی‌و‌پشتیوانینی ﴿فآمنت طائفة من بنی إسرائیل﴾ جادەستەیەك لەبەنی ئیسرائیل باوەڕیان بە عیسا هێناو ئامادەیی خۆیان دەربڕی‌و بوونە پشتیوان و سەربازی ﴿وكفرت طائفة﴾ ودەستەیەکیشیان بێباوەڕو، ڕێبازی کوفریان گرتەبەر ﴿فأیدنا الذین آمنوا‌على عدوهم﴾ جا ئێمەش پشتگیریمانکرد لەوانەی باوەڕیان هێنابوو و لە ئاست دوژمنەکانیان سەرمانخستن ﴿فأصبحوا ظاهرین﴾ جادەرەنجام بە پشتگیری خوا سەرکەوتن بەسەریاندا، کەوابوو‌ئێوەش ئەی بڕواداران! هەموو لەپشت ئایینەکەی خوادا کۆ ببنەوەو ببنە سەربازی ڕاستەقینەی ئەو، ئەوجا خواش سەرتان ئەخات بەسەر دوژمنانتاندا.

سوپاس بۆخوا لە (٢٣)ی ڕەمەزانی (١٤١٧)ك بەرامبەر (١٩٩٧/٢/٢) کاتژمێر (١)ی پاش نیوەڕۆ، لەنووسینی ئەم سوورەتە بوومەوە.

*** *** ***

## ٦٢- سورەتی ( جومعه )ـه

## مەدەنییەو ( ١١ ) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

تەوەرە سەرەکیەکەی ئەم سوورەتە، نوێژی هەینی و هەندێ ئەحکامی زۆرگرنگی نوێژی هەینییە، جابەناردنی پەیامبەر ﷺ - بەو هەموو ئەحکامە زۆرگرنگ و قەشەنگانەوە - دەست پێئەکا، تا لەوگومڕایی‌و سەر لێشێواوییەی دنیا گەلان ڕزگار بکا، پاشان باسێکی کورتی جوولەکەش دەکات ، هەتا بزانرێ چۆن تەوراتیان بۆڕەوانە کراو، پاشان چۆن بۆدواییش پشتگوێیان خست، ئینجا ئەوگوێنەدان و کەڵك وەرنەگرتنەیان لەو پەیامەی تەوراتە، دەشوبهێنێ بەحاڵی گوێدرێژێکەوە، بارێ کتێبی لێ نرابێ، ئاشکرایە کەئەو گوێدرێژە تەنها ماندوو بوونەکەی بۆدەمێنێتەوەو هیچ سوودێك لەو بارەکتێبە وەرناگرێ، دە بێشك ئەوزاناو خوێندەوارانەش کەخێرو شەڕ لە یەك ناکەنەوەو یەکێ‌کتێبخانەیەکیان هەیە، حاڵیان لە حاڵی ئەو گوێدرێژە دەچێت جوولەکەبێ، یان نا.

### هەمووشتێ پاك و بێ خەوشی خوا دەڵێ:

﴿بسم الله الرحمن الرحیم * [١] یسبح لله مافی السموات وما فی الأرض﴾ هەرچی لە ئاسمانەکان و، هەرچی لەزەویدایە پاك وبڵندیی‌و بێ‌خەوشیی‌خوا دەڵێن و تەسبیحات بۆ ئەو دەکەن، واتە: هەمووو بەردەوام گەواهیی بوون وتاك وتەنیایی خوا دەدەن، وەك دەفەرموێ: (وإن من شئ إلا یسبح بحمده..) (١٧:٤٤).﴿الملك﴾ پاشاو فەرمانڕەوای هەقە ،دەسەڵاتی تەواوو بێ‌سنووری هەیە ﴿القدوس﴾ زۆریش پاك و بێگەردو بێخەوشە، لەهەرشتێك شایستەی خوایەتی ئەونەبێت ﴿العزیز الحكیم﴾ دەسەڵاتداری کارجوان و کارڕەوایە ،بەرژەوەندیی هەموو بەندەکانی خۆی ئەزانێ لەچیدایە.

### منەتباری خواین کە پێغەمبەری بۆ ناردن:

﴿[٢] هو الذی بعث فی الأمیین رسولا منهم﴾ خوا هەر ئەوپەروەردگارەیە کە لەناوعەرەبە نەخوێندەوارەکاندا - وەك ئیبن عەباس ئەڵێ- پەیامبەرێکی پایەبەرزی لەخۆیان نارد.

تێبینی: عەرەب پێیان وتراوە: (ئوممیی)، چونکە خوێندەواریان زۆر کەمبوو، وە پەیامبەر ﷺ خۆیشی لەو بارەیەوە فەرموویەتی: ((نحن أمة أمیة، لا نكتب ولا نحسب)) متفق علیه.﴿یتلوا علیهم آیاته﴾ ئایەتەکانی

قورئانەکەی ئەویان بەسەرا دەخوێنێتەوە ,هەرچەند ئەمیش خۆی نەخوێندەوارە ﴿ويزكيهم﴾ ودڵ ودەروون و رەوالەتیان پاك دەکاتەوە, لە بیروباوەڕی بتپەرستیی و, یاسای لاروچەوتی کۆمەڵایەتیی ئەو سەردەمە ﴿ويعلمهم الكتاب والحكمة﴾ و قورئان وفەرموودەکانی خۆییان فێر دەکات ﴿وإن كانوا من قبل لفى ضلال مبين﴾ خۆ بەڕاستیش پێش هاتنی ئەو, ئەوان لەگومڕایی وسەرلێشێواوییەکی ئاشکرادا بوون: سیاسەتی پووچ وگەندەڵ، رەوشت وئەخلاقی ڕووخاو، باری کۆمەڵایەتیی پەست و قێزەون..هتد.

**موحەممەد ﷺ پێغەمبەری عەرەب و عەجەمە:**

﴿٣ وآخرين منهم لما يلحقوا بهم﴾ وەئەو پەیامبەرەی نارد، بۆخەڵکانێکی تریش کەهێشتای پێیان نەگەیشتوون , واتە:لە دوای چەرخی ئەوانەوە دین،کەوابوو پەیامبەرێکی گشتی خەڵکانیجیهانە. (ئەبووهورەیرە/ خوا لێی رازی بێت) ئەڵێت: لەخزمەتی پەیامبەردا ﷺ دانیشتبووین و، ئەم ئایەتەی: (وآخرين منهم..) هاتە خوارێ، دانیشتووەکان وتیان: ئەی پێغەمبەر!ﷺ دەبێ ئەوخەڵکانەی تر کێبن کە تۆپێغەمبەری ئەوانیشی؟ (ئەبو هورەیرە) ئەڵێت: پەیامبەرﷺ دەستی خستە سەرشانی سەلمانی (فارسیی) وفەرمووی: ((لوكان الإيمان عند الثريا لناله رجال -أو رجل- من هؤلاء)) بوخاریی و موسلیم ریوایەتیان کردووە. واتە: گریمان ئەرئیمان لای ئەستێرەی (کۆ)دا بووبا، بە تەئکید کۆمەڵەپیاوێکیئەمانە- دەستی بۆسەلمان ڕاکێشا- خۆیانیان دەگەیانی!﴿وهو العزيز الحكيم﴾ تەنها ئەویشە زاڵ ودەسەڵاتدار، کار جوان وکارزان، ئەوەتە لەوکاتەی پشێویو بێسەروبەریەدا ئەوپەیامبەرە خۆشەویستە ئازیزەی بۆناردن و، ئەویش قوڵی مەردایەتی لێهەڵمالیی وشەوو ڕۆژی نایە سەریەك، تابەماوەیەکیکەم توانی رووبەری نیوە دوورگەی عەرەبیی بەتەواوی بگۆڕێت..هتد ﴿٤ ذلك فضل الله يؤتيه من يشاء﴾ ئەو شەرەفی پەیامبەرایەتیە فەزڵ و بەهرەی خوایە، ویستی لەهەرکەسێك ببێ ,پێی دەبەخشێت، هیچ کەسێ ناتوانێ بەئارەزووی خۆی دایبڕێ بۆ خۆی ﴿والله ذوالفضل العظيم﴾ خوا خاوەن بەهرەو بەخششێکی فراوان وگەورەیە.



**جوولەکە چوونە ژێر تەورات و کاریشیان پێنەکرد:**

جاکەپێغەمبەرهات جوولەکە کەوتنە دەمبازیی وئینکاری لەوەدا کە بۆئەوانیش نێردرابێ , ئەگەرچی ناوونیشانیشی لەتەوراتدا هەبێ, جاسەبارەت بەو ئینکاریی وحاشایەیان خوا فەرمووی: ﴿٥ مثل الذين حُملوا التوراة﴾ حاڵی ئەوانەی تەوراتیان پێدراو تەکلیفکران کاری پێبکەن ﴿ثم لم يحملوها﴾ پاشان هەڵیان نەگرت، واتە: کاریان پێ نەکردو کەڵکیان لێ وەر نەگرت وەك (ئیبن عەباس) ئەڵێ: ﴿كمثل الحمار يحمل أسفارا﴾ لە حاڵی

ئەو گوێدرێژە دەچێ:کە باری کتێب هەڵدەگرێ و ناشزانێ چیان تێدایەو چیان پێبکا، دیارە بەرنامەو کتێب، بەتایبەت کتێب و بەرنامەی خوایی، بۆئەوەیە گوێیبۆ بگیردرێو کەڵکی لێوەربگیردرێ.. جوولەکە لەبەرئەوە کە خۆیان خاوەن تەورات بوون و لەوێ باسی هاتنی پێغەمبەر ﷺ کراوەو بەوردی سیفەتەکانی باسکراون، هەقبوو کە هات بەخێرایی بڕوایان پێکردبا.. بەڵام دیارە سوودیان لەتەورات وەرنەگرتوو و تەنیاماندوو بوونەکەیان بۆ مایەوە!﴿بئس مثل القوم الذین کذبوا بآیات الله﴾ ئای چەند ناشیرین وخراپە سیفەتی ئەوقەومەی ئایەتەکانی خوایان بەدرۆدەزانی ﴿والله لا یهدی القوم الظالمین﴾ وخواش ڕێنوێنی گەل وهۆزی ستەمکار ناکات بۆ ڕێگەی خێروچاکە، چونکە خۆیان ئامادەییان نیە ﴿٦ قل یا أیها الذین هادوا﴾ ئەی پێغەمبەر! ﷺ بڵێ: ئەی ئەوانەی لەسەر دینی جوولەکەن! ﴿إن زعمتم أنکم أولیاء لله من دون الناس﴾ ئەگەر پێتان وایە کە ئێوە دۆست و خۆشەویستی خوان، نەك خەڵکی‌دی ﴿فتمنوا الموت إن کنتم صادقین﴾ جا فەرموون داوای مردن بکەن ئەگەر ڕاستبێژن لە داواکەتاندا ، هەتا زوو بگەنە خزمەتی پەروەردگارتان و لەم دونیایە ڕزگاربن ﴿٧ ولا یتمنونه أبدا بما قدمت أیدیهم﴾ خۆ هەرگیز - لەبەر ئەوەی پێشی خۆیانیان خستووە-ئارەزوو و داوای مردن ناکەن، لەفەرموودەیەکدا هاتووە: ((والذی نفسی بیده لوتمنوا الموت ما بقی علی ظهرها یهودی إلا مات)) سوێند بەوکەسەی گیانی منی بەدەستە، ئەگەر داوای مردنیان کردبا تەنها جوولەکەیەك بەسەر ئەم زەویەوە بەزیندوویی نەدەماوەهەموو ئەمردن ﴿والله علیم بالظالمین﴾ وە خوایش زانایە بە کارو کردەوەی ستەمکاران ,بۆیە ناوێرن داوای مردن بکەن ﴿٨ قل إن الموت الذی تفرون منه﴾ پێیان بڵێ: ئەی پێغەمبەر! ﷺ بێگومان ئەو مردنەی کە ئێوە لەبەری هەڵدێن و ئەترسن پێی بگەن ﴿فإنه ملاقیکم ثم تردون إلی عالم الغیب والشهادة﴾ بەڕاستی هەر ئەتانگاتێ , پاشانیش دەگێڕدرێنەوە بۆ لای زانای نادیارو دیار، پەنهان و ئاشکرا , بۆلای ئەوزاتەی کە هیچ شتێکی لێناشاردرێتەوە ﴿فینبئکم بما کنتم تعملون﴾ ئینجا لەئەنجامی ئەوکاروکردەوە دەتانکرد ئاگادارتان ئەکات.

**نوێژی هەینی و چەند ئادابێکی:**

﴿٩ یا أیها الذین آمنوا إذا نودی للصلاة من یوم الجمعة﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! کاتێ ڕۆژی هەینی بانگدرا بۆ نوێژ ﴿فاسعوا إلی ذکر الله وذروا البیع﴾ جائێوە بەپەلە بچن بەدەم زیکریخواوەو, واز لەهەموو کڕین و فرۆشتنێك بێنن ﴿ذلکم خیر لکم﴾ ئەوخۆئامادەکردنەتان بۆی چاکترە بۆتان,واتە: ئەبێتە هۆی ڕەزامەندی خوا لەدونیاو لە قیامەت ﴿إن کنتم تعلمون﴾ ئەگەر بزانن و دەرکی ڕاستیی بکەن.

**هەرلە نوێژ بوونەوە بڵاوە بن و بۆ ڕۆزیی بکۆشن:**

﴿١٠ فإذا قضیت الصلاة فانتشروا فی الأرض﴾ جاکە نوێژەکە تەواوبوو, بڵاو ببنەوە بەرووی زەویدا ﴿وابتغوا من فضل الله﴾ وەداوای ڕزق و ڕۆزییو بەهرەی خوا بکەن و هەوڵی ڕۆزی بدەن و هەموو هۆیەکی ڕۆزی بدەنە بەر، بێگومان خوایش یارمەتی دەرتانە ﴿واذکروا الله کثیرا﴾ و یادی خوا زۆر بکەن ﴿لعلکم تفلحون﴾ بەوئومێدە بەختیاروسەرفراز بن.

**دواندەر کەوتە وتار لە مزگەوت دەرمەچن:**

﴿١١ وإذا رأوا تجارة أو لهوا﴾ وکاتێ بازرگانیەك، یان هەرسەرقاڵیە ك ببینن ﴿انفضوا إلیها﴾ بڵاوەی لێدەکەن ودەچن بۆلای ﴿وترکوك قائما﴾ تۆ بەراوەستاوی بەجێدێڵن!.ڕاڤەکارانی قورئان ئەڵێن: پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی هەینیی لەسەر مینبەر وتاری ئەخوێندەوە،لەوکاتەدا کاروانێکی بازرگانیی لەشامەوە گەڕایەوە، لەو کاتەیشدا مەدینەییەکان

تووشی گرانیی و قات و قڕییەك ببوون، شیاوی باسە هەرکات کاروان هاتبایەتەوە بەتەپڵ ودەفەوە پێشوازیان لێئەکرد، ئینجا کە دانیشتوانی مزگەوت و گوێگرانی وتاری هەینیی گوێیان لەوهەراو سومڕەوە بوو، ئەوانیش-بێجگە لە دوازدە کەسیان - بەپەلە هەڵسان وپەیامبەریان بەجێ هێشت!! ئەوسا ئەو ئایەتە هات وفەرمووی: ﴿قل ما عند الله خير من اللهو ومن التجارة﴾ پێیان بڵێ ئەی موحەممەدﷺ ئەو پاداش و بەهرەیە لای خوایە بۆ ئیمانداران چاکترە لەگەمەو بازرگانیی ﴿والله خير الرازقين﴾ وخوایش باشترین ڕۆزی بەخشە , کەوابوو جارێکیتر شتی وا نەکەن و تەنها لای خوا داوای ڕۆزی بکەن.

لەشەوی(٢٣/٢٤)ی ڕەمەزانی (١٤١٧)ك بەرامبەر بە (١/٢/١٩٩٧) کاتژمێر (٥:١٠) شەو, لەنووسینی تەفسیری ئەم سوورەتە بوومەوە لە شاری (مەریوان).

زۆر سوپاس بۆخوا.

*** *** ***



## ٦٣- سوورەتی (مونافیقون)ـە مەدەنییەو (١١) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتەش وەك سوورەتە مەدەنییەکانی تر باس لەهەندێ ئەحکام دەکات.. هەروەکو تەوەرەیەکیشی بەگشتی باسی دوو ڕووەکانە، هەر لەبەرئەوەیشە بە سوورەتی (منافقون) ناوبرا، لەسەرەتاوە باسی کاروورەوتی لارێ و، چەوتییان دەکات، باسی دوو زمانیی و، بەدکاریان دەکات ,دەڵێ بەردەوام دەرەوەو ناوەوەیان لەیەك جیایە، پاشان باسیدارشتنی پیلان و نەخشەکانیان دەکات بۆسەر پەیامبەرو موسڵمانان، دەڵێت بەروالەت موسڵمان دەبوون، بەلام لەناوەوە دڵیان نەخۆش و کرمۆڵ بوون، بۆیە هەمووکات خەتەری ئەوان لەوکەسانەی کە بە ئاشکرا بەرهەڵستی ئیسلام و موسڵمانانیان دەکرد زیاتربووە, هەروەکو جۆرەها وتەی نابەجێ و ناشیرینیان بەرامبەر پەیامبەرو ئەکردو ئەیانوت: پاش ماوەیەکی تر خۆیی و بەرنامەکەی ئەپێچنەوە، و دەیانگوت کاتێك موسڵمانەکان لەجەنگی (بەنوومستەلیق) گەڕانەوە ناهێڵین بێنە مەدینەوەو، ئەوانەشیان لەمەدینەدان دەریان ئەکەین.. هتد. لە کۆتاییشدا داوا لەموسڵمانان دەکات کە ئەوەندە خۆیان سەرگەرمی دونیا نەکەن و، واز لەجیهاد نەیەنن وەك دووڕووەکان! وە پێش ئەوەی هەلیان لەکیس بچێت و مردن بدا لەدەرگایان، با هەردەم خێرو صەدەقە بکەن، پێش ئەوە پەشیمان ببنەوە, پەشیمانیش هیچ کەڵکێك نەبەخشێت.

## ناڵەباری دووڕووەکان:

﴿بسم الله الرحمن الرحيم * [١] إذا جاءك المنافقون﴾ کاتێ دوو ڕووەکان هاتن بۆلات ئەی پێغەمبەر ﷺ! ﴿قالوا نشهد إنك لرسول الله﴾ ئەڵێن: شایەتی ئەدەین کە بەراستیی تۆپەیامبەری خوایت ﴿والله يعلم إنك لرسوله﴾ لەحاڵێکدا خوا خۆی ئەزانێ کە تۆ پەیامبەری ئەویت ﴿والله يشهد إن المنافقين لكاذبون﴾ وە خوا گەواهیی ئەدات کە ئەو دووڕووانە درۆدەکەن کەئەڵێن تۆ پەیامبەری خوایت ﴿[٢] اتخذوا أيمانهم جنة﴾ سوێندە درۆینەکانیان کردە سپەرو قەڵغان بۆپاراستنی ئابڕوو و سەروماڵی خۆیان، هەرشتێك دێتە پێشێ، بەخێرایی ئەوان سوێندێکی پیائەکێشن! ﴿فصدوا عن سبيل الله﴾ ڕێی دینی خوایان لەخەڵك گرت! نەیان دەهێشت کەسێك بێتەناو دینی خواوەو، تابۆیان کرابا بەسوێندی درۆو دەلەسە خەڵکیان لەخشتە ئەبرد ﴿إنهم ساء ماكانوا يعملون﴾ بەراستیی ئەوانە کارێکی خراپ و نابەجێیان کرد ﴿[٣] ذلك بأنهم آمنوا ثم كفروا﴾ ئەوبەدکاریەشیان هیئەوەبوو کە بۆ یەکەمجار باوەڕیان هێنا، پاشان کافر بوونەوە! ﴿فطبع على قلوبهم﴾ ئیتر مۆری بەدبەختی نرا بەسەردڵیاندا ﴿فهم لا يفقهون﴾ جا ئەوان تێناگەن وحەقیقەت وەرناگرن و وشەو مانای خێر نازانن, واتە: چاك وخراپ لەیەك ناکەنەوە ﴿[٤] وإذا رأيتهم تعجبك أجسامهم﴾ هەرکە دەیانبینیت لەش و قەڵافەتیان سەرسامەت دەکات، چونکە وێنەو دیمەنیان لەپیاوی هەڵکەوتەو ڕاست و ڕاساڵ ئەچێت ﴿و إن يقولوا تسمع لقولهم﴾ وئەگەر قسەش بکەن – لەڕەوانبێژیی و قسەزانیندا– گوێ بۆ قسەکەیان دەگریت ﴿كأنهم خشب مسندة﴾ لەبەر خاڵیەتی دڵیان لەئیمان, دەڵێی تەختە داری هەڵپەسێراون ﴿يحسبون كل صيحة عليهم﴾ وا دەزانن هەمووقسەو دەنگێك بۆسەر ئەوانە, واتە: ئەوەندەش دەترسن پەردە لەسەر نهێنییەکانیان هەڵماڵرێت, هەردەنگێك هات ئەوان بەزیانی خۆیانی ئەزانن و، وادەزانن باسی ئەوانە ﴿هم العدو فاحذرهم﴾ هەر ئەوانن دوژمن، دەسا ئێوەش هۆشیارو ئاگاداریان بن و خۆتان بپارێزن لێیان ﴿قاتلهم الله أنى يؤفكون﴾ خوا بیانکوژێ، لەناویان بەرێت، چۆن لەڕێی هەق لائەدرێن؟!

### پشتیان لە پێغەمبەر ﷺ کردو گەماڕۆشیان لەسەر موسڵمانان دانا!:

ئیمامی (بوخاریی) لە (زەید)ـەوە ئەڵێ: کاتێ (عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی) لە(ئوحود) گەڕایەوەو جەنگەکەی بەجێهێشت, وە لە سوپاکەی پێغەمبەر ﷺ خەڵکێکی زۆری پەشیمانکردەوەو گێڕایەوە،بەو بۆنەیەوە موسڵمانەکان ڕکیان لێهەڵگرت و بەئاشکرا قسەیان پێدەوت، ئەوجا کەخزمەکانی زانییان وا پێغەمبەر ﷺ زۆر تووڕەیە پێیان گوت: چاك وایە تۆخۆت بڕۆی بۆلای پەیامبەر ﷺ داوای لێبووردنی لێبکەیت ,تا لێتخۆش ببێ و، لەخواش داوای لێخۆش بوونت بۆ بکات، ئەویش بەتووڕەییەکەوە سەری باداو وتی: نە دەچم بۆلایی و، نەئەیشمەوێ داوای لێخۆش بوونم بۆ بکا, جا ئەکئایەتە هاتە خوارەوەو فەرمووی: ﴿[٥] وإذا قيل لهم تعالوا يستغفر لكم رسول الله﴾ کاتێ پێیان بگوترێ: وەرن بۆ لایپەیامبەری خوا داوای لێبوردنتان بۆ بکات ﴿لووا رءوسهم﴾ سەریان با ئەدەن و گاڵتەیان لێدێ! ﴿ورأيتهم يصدون وهم مستكبرون﴾ و دەیانبینی پشت هەڵئەکەن و،– لەبەر کیبرو دەعیەیان–خۆشیان بە گەورە دەزانن بێنە لای پەیامبەر ﷺ ﴿[٦] سواء عليهم أستغفرت لهم أم لم تستغفر لهم﴾ بۆ ئەوان چوونیەکە داوای لێبوردنیان بۆ بکەیت، یان بۆیان نەیکەیت ﴿لن يغفر الله لهم﴾ چونکە هەرگیز خوا لێیان خۆش نابێت ﴿إن الله لايهدي القوم الفاسقين﴾ بەڕاستیی خوا هیدایەت و ڕێنمایی هۆز وگەلانی لەسنووردەرچوو ناکات. ﴿[٧] هم الذين يقولون لاتنفقوا على من عند رسول الله حتى ينفضوا﴾ هەرئەوانن بەخەڵکی مەدینە دەڵێن: هیچ مەبەخشن بەوانەی کەلە دەورو بەریپێغەمبەری خوادان لە هەژارە کۆچکەریەکان! تا برسیان ئەبێ و بلاوەی لێدەکەن!!﴿ولله خزائن

السموات والأرض﴾ خۆ هەموو گەنجینەکانی ئاسمانەکان و زەوی هی خوایە ﴿ولكن المنافقين لايفقهون﴾ بەڵام دووڕووەکان تێناگەن و نافامن , بۆیە ئەو وتە ناشیرینانە لە زاریان دەرئەچێ ﴿[٨] يقولون لئن رجعنا إلى المدينة﴾ دووڕووەکان (واتە:عەبدوڵلاو شاگردەکانی)ئەڵێن: سوێند بێ بە خوا, ئەگەرگەڕاینەوە بۆ مەدینەو, لەم جەنگەی (بەنی مصطلق) ڕزگارمان بوو ﴿ليخرجن الأعز منها الأذل﴾ دەبێدەسەڵاتدارو بەڕێز ,واتە:ئەوان, خەڵکە رووت ولاتەکەی لێدەرکەن, واتە: پێغەمبەرو هاوەڵانی لە مەدینە وەدەرنێن! جا کە کوڕەکەی (سەلوول) ئەوەیگوت: کوڕەکەی خۆی - (عەبدوڵلا) کە موسڵمانێکی دڵسۆز بوو- چوو لەدەرگای (مەدینە)دا شیرەکەی بەدەستەوەگرت و وەستا, جاکاتێ دیتی وا باوکی هات، چووەپێش و پێیگوت: بگەڕە دواوە، ئەمەش سوێندی بێت تانەڵێیت پەیامبەر عەزیز و سەربەرزە!ئێمە زەلیل وپەست و ریسواین, نابێ بڕۆیتە نێوشارەوە, ئەویش بەناچاری پێی لێناو,ئەویش ڕێگەی بۆکردەوە بۆ ناوشار, پاشان عەبدوڵلا هات بۆلای پێغەمبەر ﷺ وتی: بیستوومە کەئەتەوێ ئەی پێغەمبەری خوا!باوکم بکوژی، جا ئەگەر نیازێکی وات هەیە وراستە, فەرمان بدە بامن خۆم بیکوژم و هەرئێستایش کەللە سەرەکەیت بۆ دێنم! ئەویش فەرمووی: نا، نایکوژین ﴿ولله العزة ولرسوله وللمؤمنين﴾ ڕێز و عیززەت وگەورەیی هەر بۆ خواو بۆپەیامبەرەکەی و بۆباوەڕدارانە ﴿ولكن المنافقين لايعلمون﴾ بەڵام دووڕووەکان نازانن ,چونکە ڕێی راستیان لێچەواشە بووە﴿[٩] ياايها الذين آمنوا لاتلهكم اموالكم ولااولادكم عن ذكر الله﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! ماڵ ومنداڵتان لەیادی خوا غافڵتان نەکەن, واتە: ئێوە وەك دووڕووەکان مەبن کەدەستیان لەجیهادوهەوڵ وتێکۆشان بەردا﴿ومن يفعل ذلك فأولئك هم الخاسرون﴾ هەرکەسێك کاری وابکات! ئەوانەن زیانمەن و دۆڕاو، چونکە فەزڵ و باوی دونیایان بەسەرپاشەڕۆژدا داوە.

الجزء الثامن والعشرون — سورة المنافقون

وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا يَسْتَغْفِرْ لَكُمْ رَسُولُ اللَّهِ لَوَّوْا رُءُوسَهُمْ
وَرَأَيْتَهُمْ يَصُدُّونَ وَهُم مُّسْتَكْبِرُونَ ﴿٥﴾ سَوَاءٌ عَلَيْهِمْ
أَسْتَغْفَرْتَ لَهُمْ أَمْ لَمْ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ لَن يَغْفِرَ اللَّهُ لَهُمْ إِنَّ
اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ ﴿٦﴾ هُمُ الَّذِينَ يَقُولُونَ
لَا تُنفِقُوا عَلَىٰ مَنْ عِندَ رَسُولِ اللَّهِ حَتَّىٰ يَنفَضُّوا وَلِلَّهِ
خَزَائِنُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلَٰكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَا يَفْقَهُونَ
﴿٧﴾ يَقُولُونَ لَئِن رَّجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الْأَعَزُّ
مِنْهَا الْأَذَلَّ وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَٰكِنَّ
الْمُنَافِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٨﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُلْهِكُمْ
أَمْوَالُكُمْ وَلَا أَوْلَادُكُمْ عَن ذِكْرِ اللَّهِ وَمَن يَفْعَلْ
ذَٰلِكَ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ ﴿٩﴾ وَأَنفِقُوا مِن مَّا رَزَقْنَاكُم
مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ فَيَقُولَ رَبِّ لَوْلَا أَخَّرْتَنِي
إِلَىٰ أَجَلٍ قَرِيبٍ فَأَصَّدَّقَ وَأَكُن مِّنَ الصَّالِحِينَ ﴿١٠﴾ وَلَن
يُؤَخِّرَ اللَّهُ نَفْسًا إِذَا جَاءَ أَجَلُهَا وَاللَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١١﴾

سُورَةُ التَّغَابُنِ

٥٥٥

**بەر لەوە بمرن صەدەقە بکەن:**

﴿[١٠] وانفقوا مما رزقناكم﴾ لەو ماڵ وسامانەی کردوومانە ڕۆزیتان ببەخشن ﴿من قبل ان يأتي احدكم الموت﴾ پێش ئەوەی مردن یەخەتان پێبگرێ ﴿فيقول رب لولا اخرتني إلى اجل قريب﴾ ئەوسابڵێ: ئەی پەروەردگارەکەم! خۆزگە مردنی منت بۆ ماوەیەکی نزیك دواخستبا ﴿فاصدق واكن من الصالحين﴾ ئینجامالم دەبەخشی و لەصاڵحان و چاکە خوازان دەبووم ﴿[١١] ولن يؤخر الله نفسا إذا جاء اجلها﴾ و خۆ هەرکەسێك ئاکامیتەواوبوو, هەرگیز خوا دوای ناخات, جاکەوابوو پێش ئەوە ئەوخۆزگە بێجێگەیە بخوازن فریای خۆتان بکەون ﴿والله خبير بما تعملون﴾ وخواش بەئاگایە بەو کاروکردەوە ئێوە دەیکەن، وە بەپێی ئەوەش پاداش و تۆڵەتان ئەدات. لە کۆتاییدا درۆودوسڵاو بۆ سەر گیانی پاکی پەیامبەری سەروەرو سالار.

لە (٢٤)ی ڕەمەزانی (١٤١٧)ك بەرامبەر بە (١٩٩٧/٢/٢) ز, كاتژمێر (٥)ی سەر لەئێوارە, لە تەفسیری سوورەتی (منافقون) بوومەوە.

*** *** ***

## ٦٤- سوورەتی (تەغابون)ـە

## مەدەنییەو (١٨) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان



بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ ۖ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ ۖ
وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿١﴾ هُوَ الَّذِي خَلَقَكُمْ فَمِنكُمْ كَافِرٌ
وَمِنكُم مُّؤْمِنٌ ۚ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢﴾ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ
وَالْأَرْضَ بِالْحَقِّ وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ ۖ وَإِلَيْهِ الْمَصِيرُ ﴿٣﴾
يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَيَعْلَمُ مَا تُسِرُّونَ وَمَا تُعْلِنُونَ ۚ وَاللَّهُ
عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ ﴿٤﴾ أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَأُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِن قَبْلُ
فَذَاقُوا وَبَالَ أَمْرِهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٥﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُ كَانَت تَّأْتِيهِمْ
رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ فَقَالُوا أَبَشَرٌ يَهْدُونَنَا فَكَفَرُوا وَتَوَلَّوا ۚ وَّاسْتَغْنَى
اللَّهُ ۚ وَاللَّهُ غَنِيٌّ حَمِيدٌ ﴿٦﴾ زَعَمَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَن لَّن يُبْعَثُوا ۚ قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّي
لَتُبْعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلْتُمْ ۚ وَذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ ﴿٧﴾ فَآمِنُوا بِاللَّهِ
وَرَسُولِهِ وَالنُّورِ الَّذِي أَنزَلْنَا ۚ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٨﴾ يَوْمَ
يَجْمَعُكُمْ لِيَوْمِ الْجَمْعِ ۖ ذَٰلِكَ يَوْمُ التَّغَابُنِ ۗ وَمَن يُؤْمِن بِاللَّهِ وَيَعْمَلْ
صَالِحًا يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّئَاتِهِ وَيُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا
الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ۚ ذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴿٩﴾



ئەم سوورەتە لەپاش سوورەتی (تەحریم)ـەوە هاتووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا كە لەمەدینەدا هاتووە، هەر لەسوورەتە مەككەییەكان ئەچێ، چونكە ئەمیش وەك ئەوان باسی یەكتا پەرستیی خوای گەورە ئەكات. بۆیەكەمجار باسی باڵادەستیی و گەورەیی و دەسەڵاتی خوا ئەكات، ئینجا تیشكێك ئەخاتە سەر گەلانی پێشوو، ئەنجامی هەموو كەسێكیش هەڵدەسەن گێنێ و، هەمووكەسیش دەبێ كێڵگەی خۆی بخواتەوە، فەرمان بەگوێ رایەڵی و فەرمان بەرداری بۆ خواو پەیامبەر ﷺ ئەدا، هۆشیاریی بەمرۆڤ ئەدا: كەماڵ و منداڵ و خێزان و هاوسەر لەخشتەیان نەبەن تا دەست لەجیهاد هەڵبگرن. كۆتاییشی دێ بە ئامۆژگاری كردنی ئادەمیزاد كە هەمیشە دوور بگرن لەرژدیی و چرووكیی، هەروەك پێیان دەڵێت كە دارایی لەڕێگەی خوادا بەخت بكەن بۆ بەرز كردنەوەی بڕیارو وشەی خوا جا بەم شێوەیەش دەست پێ ئەكات: ﴿بسم الله الرحمن الرحيم * [١] يسبح لله ما فى السموات وما فى الارض﴾ هەرچی لەئاسمانەكان و لەزەویدا یە, پاك وخاوێنیی و بێخەوشی خوا ئەڵێن , خۆگومانیش نیە كەهەموو بوونەوەر بەڵگەو نیشانەیە لەسەر بوونی خوا ﴿له الملك وله الحمد﴾ دەسەڵات و موڵكایەتی هەر بۆ ئەوە، سوپاس وستاییش تەنها بۆ ئەوە ﴿وهو على كل شئ قدير﴾ هەرئەویشە بەسەر هەمووشتێكدا بەتوانایەو, ویستی لەهەر شتێك ببێ ئەیكات.

### باوەڕو بێ باوەڕی بە دەست خوایە:

﴿[٢] هو الذى خلقكم﴾ هەر ئەو خوایەیە ئێوەی دروستكردووە ﴿فمنكم كافر ومنكم مؤمن﴾ ئینجا هەتانە بێ باوەڕوو كافر، بە ئارەزووی خۆی لەفیترەت لایداوە، هەیشتانە بەئیمان و باوەڕدار, هەمیشە لەسەر نەخشەی فیترەت ئەڕواولانادا. ئیمامی (موسلیم) لە (سەهل)ەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمووێ:((إن الرجل ليعمل عمل أهل الجنة فيما يبدو للناس وهو من النار، وإن الرجل ليعمل عمل أهل النار فيما يبدو للناس وهو من أهل الجنة)). واتە: پیاوی واهەیە هەردەم كاروكردەوەی بەهەشتیانە ئەكا –بەپێی ڕەواڵەت – كەچی لەئەنجامدا ئەهلی ئاگرە، پیاوی

واش هەیە بەردەوام وەکوخەڵکی جەهەننەمی کارئەکا، کەچی سەرەنجامی بەهەشتیە، مەبەست ئەوەیە کە زانستیی (ئەزەلیی) خوا پەیوەندی بە هەموو شتێکەوە هەیەو، چاك ئەزانێ ئەنجامی گشت شتێ چی دەبێت.﴿والله بما تعملون بصير﴾ وە خوا بینایە بەوکارو کردەوە دەیکەن ,هەرچی بکەن دێتەوە ڕێتان ﴿ خلق السموات والأرض بالحق﴾ خوا ئاسمانەکان و زەویی بەهەق بەدیهێناوە ﴿وصوركم فأحسن صوركم﴾ وە بەجوانترین شێوە وێنەی کێشاون: قەڵافەت وبەژن وباڵای جوان و ڕێك وپێك و،لە گەڵ ئەوهەموو ژیریی و وردەکارییەدا ﴿وإليه المصير﴾ سەرەنجامیش هەر بۆ لایئەوە,لای ئەوهەمووپاداشت وتۆڵەیەك وەردەگرن ﴿ يعلم ما فى السموات والأرض﴾ هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوییدایە –وردو درشت – خوا دەیزانێ﴿ويعلم ماتسرون وما تعلنون﴾ وهەر چیش ئێوە بیشارنەوەو,هەرچیش ئاشکرای بکەن، دەیزانێ و لای ئەو یەکسانە ﴿والله عليم بذات الصدور﴾ خواش بەوەی لەسینگ و دڵەکاندایە زاناو بەئاگایە.

**بەرلە ئێوە خەڵکی زۆر قڕانی تێکەوت:**

﴿ الم يأتكم نبأ الذين كفروا من قبل﴾ ئایا هەواڵی کافران وبێباوەڕانی پێشی خۆتانتان – کە بەر لە ناردنی تۆ –کافرو بێ باوەڕ بوون پێ نەگەیشتوون کە چ سزایەکیان ئەوقەبوو، کاتێ سەرپێچیان کرد؟! ﴿فذاقوا وبال امرهم﴾ کە سزای بێ باوەڕیی و تاوانی خۆیانیان چیشت لەدونیادا ﴿ولهم عذاب اليم﴾ ولە پاشەڕۆژیشدا سزایەکی ئێش پێگەیەنەرو دەردناکیان بۆهەیە ﴿ ذلك بأنه كانت تاتيهم رسلهم بالبينات﴾ ئەو سزایەش بەو هۆیەوە بووکە بەراستیی پێغەمبەرەکانیان بەچەندین بەڵگەو مۆجیزەی روونەوە بۆدەهاتن و هەریەکەشیان داوای گەلەکەیانی ئەنجام دەدا ﴿فقالوا ابشر يهدوننا﴾ کەچی وتیان: ئایامرۆڤێك ڕێنماییمان دەکات؟! ﴿فكفروا وتولوا﴾ جا دەرەنجام کافرو بێباوەڕبوون و پشتیان هەڵکرد لە ئیمان ﴿واستغنى الله﴾ وخوایش بێنیاز بوو لێیان و وێڵیکردن ﴿والله غنى حميد﴾ وخوا خوایەکیبێنیازە لەهەموو شتێك، هەر لەزاتی خۆیدا سوپاسکراوە.

**ژیانەوەی پاش مردن ڕاست و ڕەوایە:**

﴿ زعم الذين كفروا ان لن يبعثوا﴾ ئەوانەی کافرو بێ بڕوا بوون گوتیان: هەرگیزپاش مردن زیندوو ناکرێنەوە! ﴿قل بلى وربى لتبعثن﴾ پێیان بڵێ ئەی پێغەمبەر! ﷺ بەڵێ سوێند بەپەروەردگارم بێگومان لە گۆڕەکانتاندا دەر ئەهێنرێن و زیندوو ئەکرێنەوە ﴿ثم لتنبؤن بما عملتم﴾ پاشان لەهەر کارو کردەوەیەك ئەنجامتان داوە ئاگادار دەکرێن، لەگەورەو لە بچووك، و هەر بەوەش پاداشت دەدرێنەوە ﴿وذلك على الله يسير﴾ ئەوەیش بۆ خوا کارێکی ئاسانە ,چونکە ئێوە خۆتان ئەزانن کە لەسەرتاوە شتێك نەبوون و وجوودتان نەبوو, پاشان دروستیکردن وبوون, باشە ئیترچۆن ناتوانێ زیندووتان بکاتەوە؟! ﴿ فآمنوا بالله ورسوله والنور الذى انزلنا﴾ جا ئیدی باوەڕ بێنن بەخواو پەیامبەرەکەی، وە بەو نوورو ڕووناکیەی بۆمان دابەزاندوّتە خوارەوە ﴿والله بما تعملون خبير﴾ وخوا ئاگایە بەو کارو کردەوەیەی ئەنجامی دەدەن.

**ڕۆژی قیامەت ڕۆژی تێکشکانە:**

﴿ يوم يجمعكم ليوم الجمع﴾ ئەوڕۆژە وەبیر بێنە کە خوا هەمووتان کۆئەکاتەوە، بۆ ڕۆژی کۆکردنەوەی تەواوی گەلان بۆپاداشت وتۆڵە ﴿ذلك يوم التغابن﴾ ئەو ڕۆژەیە ڕۆژی زیانباریی تاوانکارانە، زیانی بێ بڕوایان دەردەکەوێ، بەهۆی کافر بوونیانەوە ﴿ومن يؤمن بالله ويعمل صالحا يكفر عنه سيئآته﴾ وە هەرکەسێك باوەڕ بەخوا بێنێ و کاری چاك ئەنجام بدات, خوا گوناهەکانی دەپۆشێ ﴿ويدخله جنات تجرى من تحتها الأنهار﴾ و ئەیخاتە ناوچەند

باخێکەوە لە بەهەشتداکە لە بنکەکانیانەوە ئاوو رووبار دەڕوات ﴿خالدين فيها أبدا﴾ بە هەتاهەتاییش تێیدا دەمێننەوەونامرن ﴿ذلك الفوز العظيم﴾ تەنها ئائەوەیە سەرفرازیی و سەرکەوتنە گەورەکە ﴿ ١٠ والذين كفروا وكذبوا بآياتنا﴾ وە ئەوانەش بێ باوەڕبوون و نکووڵیئایەتەکانی ئێمەیان کرد ﴿أولئك أصحاب النار خالدين فيها﴾ ئائەوانە دۆزەخین و بە هەتاهەتایی تێیدادەمێننەوە ﴿وبئس المصير﴾ ودۆزەخیش سەرەنجام و جێیەکی زۆر خراپە. هەموو بەڵایە بە ئیزنی خوا دێ: ﴿ ١١ ما أصاب من مصيبة إلا بإذن الله﴾ وهەر بەڵاو ناخۆشییەك پێش بێت، بێ فەرمانِ و بڕیاری خوای کارزان نابێت, واتە:ئیرادەو ویستی ئەوی لەگەڵە، کەوابوو خۆتان تەنها تەسلیمی ئیرادەو ویستی خوا بکەن ﴿ومن يؤمن بالله يهد قلبه﴾ وهەرکەسێك باوەڕی بەخوا هەبێت، ئەویش دڵی هیدایەت دەکاو دایدەمەزرێنێت لەئارامیی و، خۆگرتن لە بەرامبەر هەر بەڵاونەهامەتیەك پێش بێت ﴿والله بكل شئ عليم﴾وخوای بەهەمووشتێك ئاگاوزانایەو، دەزانێ ئەودڵانە لەکاتی خۆشی وناخۆشیدا چۆنن.

## بەر فەرمانی خواو پێغەمبەر بن:

﴿ ١٢ وأطيعوا الله وأطيعوا الرسول﴾ وگوێڕایەڵیی خوا بکەن و، فەرمانبەرداری پەیامبەر بکەن ﴿فإن توليتم فإنما على رسولنا البلاغ المبين﴾ جا ئەگەر پشتتان هەڵکرد و گوێڕایەڵ نەبوون ,ئەوە خۆتان زەرەر دەکەن، چونکە تەنها گەیاندنێکی نما و ئاشکرا لەسەر شانی پەیامبەری ئێمەیە, ئیتر هەموو کەسێك گلەیی ئەکەوێتە سەر ئەستۆی خۆی ﴿ ١٣ الله لا إله إلا هو﴾ ئەو خوایە، خوایەکی بە هەقی وایە, بێجگە لەخۆی هیچ پەرستراوێکی تر نیە ﴿وعلى الله فليتوكل المؤمنون﴾ دەبا بڕواداران تەنها پشت بەخوا ببەستن و متمانەی تەواویان هەر بەو ببێ.

## بڕێ ژن و منداڵ نەیارو دوژمنە:

راقەکارانی قورئان ئەڵێن: دەستەیەك لەموسڵمانەکان ویستیان کۆچ بکەن و بڕۆن بۆمەککە، جا ماڵ و منداڵ و ژنانیان بوونە ئەستەنگ لە بەردەم ڕۆیشتنەکەیان، دەرەنجام دواکەوتن، پاشان کاتێ کەهاتنە مەدینە سەیرئەکەن وا زۆربەی خەڵکی مەدینە فێری ئیسلامەتی بوون! ئیتر ئەوانیش پەشیمان بوونەوە لەسەر کارەکەیان و ویستیان ئەزیەتی ژن ومنداڵەکانیان بدەن, ئینجا لە بەرامبەر ئەوەوە، ئەم ئایەتە هات و فەرمووی: ﴿ ١٤ يا أيها الذين آمنوا إن من أزواجكم وأولادكم عدوا لكم﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! بەراستیی هەندێ لەژنان و لە منداڵتان دوژمنن بۆتان,سەرقاڵتان دەکەن لە تاعەت و کاری چاکە بەهۆی خۆشە ویستیتانەوە بۆیان ﴿فاحذروهم﴾ جا وریابن وخۆتان بپارێزن لەخۆشەویستی ناشەرعیی بۆیان ﴿وإن تعفوا وتصفحوا وتغفروا﴾ جائەگەر بیانبەخشن لەوەکە پەکیانخستن لە کۆچکردن و,بیانپۆشن و لێیان خۆش بن ﴿فإن الله غفور رحيم﴾ بێگومان خوا خوایەکی زۆر لێبوردەیە، زۆردلاوایە. ﴿ ١٥ إنما أموالكم وأولادكم فتنة﴾

الجزء الثامن والعشرون | سورة التغابن

وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ خَٰلِدِينَ فِيهَاۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ﴿١٠﴾ مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۗ وَمَن يُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ يَهۡدِ قَلۡبَهُۥۚ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ﴿١١﴾ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَۚ فَإِن تَوَلَّيۡتُمۡ فَإِنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ﴿١٢﴾ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴿١٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ مِنۡ أَزۡوَٰجِكُمۡ وَأَوۡلَٰدِكُمۡ عَدُوّٗا لَّكُمۡ فَٱحۡذَرُوهُمۡۚ وَإِن تَعۡفُواْ وَتَصۡفَحُواْ وَتَغۡفِرُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿١٤﴾ إِنَّمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَأَوۡلَٰدُكُمۡ فِتۡنَةٞۚ وَٱللَّهُ عِندَهُۥٓ أَجۡرٌ عَظِيمٞ ﴿١٥﴾ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُمۡ وَٱسۡمَعُواْ وَأَطِيعُواْ وَأَنفِقُواْ خَيۡرٗا لِّأَنفُسِكُمۡۗ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفۡسِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴿١٦﴾ إِن تُقۡرِضُواْ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗا يُضَٰعِفۡهُ لَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ شَكُورٌ حَلِيمٌ ﴿١٧﴾ عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿١٨﴾

ترتيبها ٦٥ | سُورَةُ الطَّلَاقِ | آياتها ١٢

٥٥٧

بەڕاستیی ماڵ و منداڵەکانتان بەڵان بۆتان, پێیان تاقیدەکرێنەوە، تا دەرکەوێ کامتان گوێرایەڵی دەکەن و، کامیشتان یاخی دەبن، کەوابوو بێدارو هۆشیار بن پێیان فریو نەخۆن! ﴿والله عنده اجر عظیم﴾ لەکاتێکدا خوای میهرەبان پاداشتێکی گەورەی لایە, واتە: بەهۆی ئەو سەروەت و سامان و ژن ومنداڵانەتانەوە دەستخەڕۆ نەبن.

**تا دەتوانن لە خوا بترسن:**

﴿[16] فاتقوا الله ما استطعتم﴾ جا تەقوای خوا بکەن چەندێکتان توانی، پێغەمبەریش ﷺ لەو بارەیەوە دەفەرمووێ: ((إذا أمرتكم بأمر فائتوا منه مااستطعتم، وما نهيتكم عنه فاجتنبوه)) فتح الباری: ٢٦٤/١٣. هەندێ لە زاناکانیش دەڵێن: ئەم ئایەتەی (فاتقوا الله ماستطعتم)، بەئایەتی (یاأیها الذین آمنوا اتقوا الله حق تقاته) (١٠٢/٣) سڕاوەتەوە. ﴿واسمعوا واطیعوا﴾ گوێرایەڵ بن و ببیستن,هەر ئامۆژگارییەك ئەکرێن وە بڕیارو فەرمانەکانم جێبەجێ بکەن ﴿وانفقوا خیرا لأنفسکم﴾ وسامان وماڵ بەخت بکەن لەڕێی خوادا، چونکە ئەبێتە مایەی چاکیی وسوود بۆخۆتان ﴿ومن یوق شح نفسه﴾ وەئەوی لە خواوە بپارێزرێ لە رژدیی و چرووکی دەروونی ﴿فاولئك هم المفلحون﴾ ئائەوجۆرە کەسانەن سەرفرازوبرەوە ﴿[17] إن تقرضوا الله قرضا حسنا﴾ ئەگەرقەرزێ باش بدەن بەخوا, واتە: لەرێی خێرو چاکەدا بەختی بکەن ﴿یضاعفه لکم﴾ خوا بۆتان چەند بەرامبەر ئەکات ﴿ویغفر لکم﴾ و لێشتان خۆش ئەبێ ﴿والله شکور حلیم﴾ وخواخوایەکی زۆر پاداش دەرەوەی چاکەکارانە، زۆریش لەسەر خۆو خۆڕاگرە,پەلەناکات لە تۆڵەدا ﴿[18] عالم الغیب والشهادة العزیز الحکیم﴾ زانای نادیارو دیارە ,پەنهان و شاراوە لای ئەو یکسانە ودیارە, ودەسەڵاتداری کارجوان و کارڕەوایە لەهەموو بڕیارەکانیدا.

لەشەوی ٢٥/٢٦ی رەمەزانی (١٤١٧)ك بەرامبەر بە (٣-٤/٢/١٩٩٧ کاتژمێر (٧/١٥) خولەك

لەنووسینی تەفسیری سوورەتی (تغابن) بوومەوە.

زۆر سوپاس بۆ خوای میهرەبان.

*** *** ***

٦٥- سوورەتی (تەلاق)ـە

مەدەنییەو (١٢) ئایەتە.

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

ئەم سوورەتە لەپاش سوورەتی (ئینسان)ـەوە هاتووە، کەمێ درێژ تر باسی ژن ومێرد دەکات، بەتایبەت مەسەلەی تەلاق و چۆنێتی عیددەو نەفەقەو خەرجی ژنان، نیشتگاو مەنزڵ و جێگەی خەوو خەوتن و ئیسراحەتیان..هتد. دیاریکردنی کاتی تەڵاقدان - ئەگەر هەردەبوو تەڵاق بدرێت- واتە:کەی پەسەند وشەرعییە، ئەوەیش بۆئەوەیە کە پیاوان پەلە نەکەن لە تەڵاقدانی ژنەکانیاندا، چونکە خوا تەڵاقی بۆ کاتی ناچاریی و نەمانی توانای پێکەوە ژیان داناوە، و ئەگەر ناچاری نەبوایە، ڕێگەی تەڵاق نەئەدرا.. داوا ئەکات پاش تەڵاقکە,حیسابی عیدەیان ڕابگرن، بۆ ئەوەی رشتەو نەژاد تێکەڵ بەیەك نەبێ، هەروەها بۆئەوەش کە ئەوژنە تەڵاقدراوە بەعیددەوە زۆر نەمێنێتەوە ئەگەر بیەوێ شوو بکاتەوە، هەموو جۆرە عیددەیەك باس ئەکات.. بەیناو بەینیش ئەگەڕێتەوە سەر تەقوا بۆڕاگرتنی یاساو سنوورەکان، وە بۆئەوەی ژن و پیاوەکە لەترسی خوا ستەم لەیەك نەکەن، وێنەیەکی سەرکەشیی و سەرسەختی گەلانی پێشوویش ئەخاتە پێش چاو بۆ ئەوەی پتر دەست بگیرێ بەپیادە کردنی

ئەحکامی خواوە، کۆتاییشی دێت بەباسکردنی توانایی‌و دەسەڵاتی خوای گەورە لەدروستکردنی ئاسمانەکان و زەویدا.

## ژن دەبێ لە هەیدەی خۆیدا تەلاق بدرێت:

﴿بسم الله الرحمن الرحيم* [١] يا أيها النبی إذا طلقتم النساء﴾ ئەی پەیامبەر!ﷺ بەئوممەتەکەت بڵێ: کاتێویستتان ژنەکانتان تەلاق بدەن ﴿فطلقوهن لعدتهن﴾ جالەکاتی دەست پێکردنی عیددەیاندا تەلاقیان بدەن, واتە:لە حەیز پاك بن و،لەو پاکیەشدا مێرد لەگەڵیا دروست نەبووبێت. لەفەرموودەیەکدا هاتووە: ((فليطلقها طاهرا قبل أن يمسها، فتلك العدة التی أمر الله تعالی أن يطلق لها النساء)) بوخاریی (فتح الباری:٨/٢٥١) موسلیم:٢/١٠٩٤.

الجزء الثامن والعشرون — سورة الطلاق

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحۡصُواْ
ٱلۡعِدَّةَۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ رَبَّكُمۡۖ لَا تُخۡرِجُوهُنَّ مِنۢ بُيُوتِهِنَّ
وَلَا يَخۡرُجۡنَ إِلَّآ أَن يَأۡتِينَ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖۚ وَتِلۡكَ حُدُودُ
ٱللَّهِۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَقَدۡ ظَلَمَ نَفۡسَهُۥۚ لَا تَدۡرِي لَعَلَّ
ٱللَّهَ يُحۡدِثُ بَعۡدَ ذَٰلِكَ أَمۡرٗا ١ فَإِذَا بَلَغۡنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمۡسِكُوهُنَّ
بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ فَارِقُوهُنَّ بِمَعۡرُوفٖ وَأَشۡهِدُواْ ذَوَيۡ عَدۡلٖ مِّنكُمۡ
وَأَقِيمُواْ ٱلشَّهَٰدَةَ لِلَّهِۚ ذَٰلِكُمۡ يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ يُؤۡمِنُ
بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا ٢ وَيَرۡزُقۡهُ
مِنۡ حَيۡثُ لَا يَحۡتَسِبُۚ وَمَن يَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسۡبُهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ
بَٰلِغُ أَمۡرِهِۦۚ قَدۡ جَعَلَ ٱللَّهُ لِكُلِّ شَيۡءٖ قَدۡرٗا ٣ وَٱلَّٰٓـِٔي يَئِسۡنَ
مِنَ ٱلۡمَحِيضِ مِن نِّسَآئِكُمۡ إِنِ ٱرۡتَبۡتُمۡ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَٰثَةُ أَشۡهُرٖ
وَٱلَّٰٓـِٔي لَمۡ يَحِضۡنَۚ وَأُوْلَٰتُ ٱلۡأَحۡمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعۡنَ حَمۡلَهُنَّۚ
وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مِنۡ أَمۡرِهِۦ يُسۡرٗا ٤ ذَٰلِكَ أَمۡرُ ٱللَّهِ أَنزَلَهُۥٓ
إِلَيۡكُمۡۚ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يُكَفِّرۡ عَنۡهُ سَيِّـَٔاتِهِۦ وَيُعۡظِمۡ لَهُۥٓ أَجۡرًا ٥

أسكنوهن من — ٥٥٨

واتە: ئەگەر ژنت تەلاقدا، لەپاکیدا و پێش چوونەلای تەلاقی بدە، هەر ئەوەیشە کەخوا فەرمووی: ژنان لەکاتی عیددەیاندا تەلاق بدەن.﴿واحصوا العدة﴾ حیسابی سەرەتاو کۆتایی عیددەیان بەوردیی بژمێرن، تا لێتان تێك نەچێ و ژنەکەیش بە عیددەوە زۆر نەمێنێتەوە، نەوەك تووشی زیان ببێ ﴿واتقوا الله ربكم﴾ وەلەخوای گەورەو پەروەردگارتان بترسن و سنوورەکانی مەشکێنن و گوێرایەڵی بن ﴿لاتخرجوهن من بيوتهن﴾ لەخانووەکانیاندا دەریان مەکەن پاش تەلاقدان، تا عیددەیان تەواو ئەبێت، واتە: لەپێش تەلاقداندا لەکوێ دەژییان با هەر لەوێ بمێننەوە ﴿ولا يخرجن﴾ ژنەکانیش بۆخۆیان بەبێ ڕەزامەندیی لەماڵ دەرنەچن، چونکە هێمان بەسراونەتەوە بەپیاوەوە ﴿إلا ان يأتين بفاحشة مبينة﴾ مەگەر کارێکی خراپی ئاشکرا بکەن.(ئیبن عەباس) و هەندێ لەهاوەڵانیتر ئەڵێن: مەبەست بە (فاحیشە) زیناو، هەموو جۆرە ڕەفتارێکی تری دزێوو نەگونجاوی ئەو ژنەیە.ئیمامی (شافیعی) ئەڵێ: مەبەست بەو (فاحیشە)یە، جنێوو دەم درێژی ژنەکەیە لەگەڵ خزم و کەس و کاری مێردەکەیدا. ئەو کاتە با لەوێ نەمێنن و بچن بۆ ماڵی مەحرەمی خۆیان.﴿وتلك حدود الله﴾ و ئەمەیە بەرنامەو سنوورەکانی خوا لەبارەی تەلاقەوە هۆشیاربن! دەست درێژی نەکەن ﴿ومن يتعد حدود الله فقد ظلم نفسه﴾ هەرکەسێك لە بەرنامەو سنوورەکانی خوا تێپەڕێ، بێگومان ستەمی لە خۆیکردووەو سنوری خوای بەزاندووە ﴿لاتدری لعل الله يحدث بعد ذلك أمراً﴾ تۆ چووزانی دوای تەلاقدانەکە چیدەبێ؟ لەوانەیە خوای کارزان کاری تازەپێش بێنێت: ژن و پیاوەکە پەشیمان ببنەوە بۆ یەکتر، ئەوکاتە دەست بکەنەوە بەژن ومێردی خۆیان و ژیانێکی نوێ، بۆیە دەڵێین: با لەخانووەکانی خۆیاندا بمێننەوەو دەرنەچن.

**لەگەڵ تەڵاقدراودا بە تەرزێکی پەسەند مامەڵە بکەن:**

﴿[٢] فإذا بلغن أجلهن﴾ جاکە نزیکبوو- دوای یەك تەڵاق، یان دووتەڵاق- عیددەیان تەواو ببێ ﴿فأمسكوهن بمعروف أو فارقوهن بمعروف﴾ ئەوسا یان بەباشی ڕایانگرن و بیانهێننەوە ژێر نیکاحی خۆتان ،هاوڕێ لەتەك هەڵس و کەوتی چاك و رەفتاری باشدا، یاخود وازیان لێبێنن و لێیان جیاببنەوە بەچاکی، ئەوانیش عیددەی خۆیان تەواو بکەن وهەرچییان ئەکەوێتە لاتان بەشێوەیەکی شەرعیی بیاندەنێ لەمارەیی و.. هتد ﴿وأشهدوا ذوي عدل منكم﴾ وبۆ ئەنجامدانی هەردوو بارەکە: (گێڕانەوەیان،یان تەڵاقدانیان بەیەکجاری) دووکەسی دادگەرو دادپەروەر لەخۆتان بگرنە شایەد ﴿وأقيموا الشهادة لله﴾ ئێوەیش -ئەی شاهێدەکان- بەڕێك وپێکی بۆ خوا شایەتی بدەن ﴿ذلكم يوعظ به من كان يؤمن بالله واليوم الآخر﴾ ئەوانەباسکران پەندێکن ،ئامۆژگاری ئەوکەسەیان پێدەکرێت باوەڕی بەخواو بەڕۆژی دوایی هەبێ ﴿ومن يتق الله يجعل له مخرجا﴾ هەرکەسێك لە خوا بترسێ‌و سنوورەکانی بپارێزێ، خوا دەرووی خێری لێ ئەکاتەوە ﴿[٣] ويرزقه من حيث لا يحتسب﴾ وە ڕزق و ڕۆزی دەداتێ لەشوێنێکەوە کە خۆیشی گومانی نەدەبرد،واتە:ڕێنموونی دۆزینەوەی ڕێگای ژیانی دەکات ﴿ومن يتوكل على الله فهو حسبه﴾ وەهەرکەسێك پشت بەخوا ببەستێ دوای بەکار هێنانی هۆکار، ئەوە تەنیا خوای بەسەو کاروباری بۆ ئاسان دەکات ﴿إن الله بالغ أمره﴾ چونکە بێگومان هەرچی خوا بڕیاری لەسەر بێت، هەرئەنجامی دەداو دەیگەیەنێتەجێ ﴿قد جعل الله لكل شئ قدرا﴾ بەڕاستیی بۆ هەمووشتێك خوا کات وئەندازەیەکی دیاریکردووە:خۆشیی‌و، ناخۆشیی، هەردووکیان تەواو دەبن و ئەبڕێنەوە.

**ژنانی مەیووس لە عوزرو، ئەوانەشیان عوزر ناشۆن:**

ئینجا پاش ئەوە لەسوورەتی (بەقەرە)دا عیددەی ئەوژنانەی باسکرد حەیزیان هەیەودەکەونە بێ نوێژی،ئیستا دێتە سەرباسی عیددەی ئەو ژنانە هێشتای بەتەمەن منداڵن، وەیان پیرن وحەیزیان نەماوە: ﴿[٤] واللائي يئسن من المحيض من نسائكم إن ارتبتم﴾ ئەو ژنانەتان کە بێهیوا دەبن لە بەر پیری لە تێکەوتنی (حەیز)، ئەگەر گومانتان هەبوولەئەندازەی عیددەکەیاندا ﴿فعدتهن ثلاثة أشهر﴾ ئەوا عیددەیان سێ‌مانگە ﴿واللائي لم يحضن﴾ وەعیددەی ئەوانەش کەهێشتا حەیزیان نەبینیوە لەبەر باڵق نەبوون، یان هەر هۆیەکی تر، هەر سێ‌مانگە ﴿وأولات الأحمال أجلهن أن يضعن حملهن﴾ عیددەی ئەوژنانەش دووگیانن، ئەوکاتەیە منداڵەکەیان دادەنێن ،ئیتر تەڵاق درابن، یان مێردیان مردبێت ﴿ومن يتق الله يجعل له من أمره يسرا﴾ وەهەر کەسێك خۆ بپارێزێ لەبێ فەرمانی خوا، ئەویش کاروباری بۆ ئاسان ئەکات ﴿[٥] ذلك أمر الله أنزله إليكم﴾ ئەوەی باسکرا لەحوکمی تەڵاق و عیددەو ڕەجعەت، فەرمانی خوایە بۆ ئێوەی دایبەزاندووە کاری پێ بکەن ﴿ومن يتق الله يكفر عنه سيئاته﴾ وە هەرکەسێك لەخوا بترسێ وکار بەتاعەتی خوا بکا، خواش لەگوناحەکانی پاکی ئەکاتەوەو چاوپۆشی لێ دەکات ﴿ويعظم له أجرا﴾ پاداشتێکی فرە گەورەی پێدەبەخشێت.

**ژنانی تەڵاقدراو چۆن دەستان دەڕوا جێیان بکەنەوە:**

﴿[٦] أسكنوهن من حيث سكنتم من وجدكم﴾ ئەو ژنانەی تەڵاقێکیان ماوە، یان دوو تەڵاق ،بەپێی تواناو دەسەڵاتتان لەو جێگەیخۆتان سکوونەتتان تیا کردووە دایان نێن و تفاقی باشیان بۆ دابین بکەن ﴿ولا تضاروهن لتضيقوا عليهن﴾ زیانیان پێ مەگەیەنن ،تا تەنگەتاویان بکەن لە نەفەقەو لە جێگەدا بۆ ئەوەی ناچاریان بکەن بە دەرچوون لە ماڵەکانیان ﴿وإن كن أولات حمل﴾ و ئەگەر ئەو ژنانە دوو گیان بوون ،ئەگەرچی سێ‌تەڵاقەش درابن

﴿فأنفقوا عليهن حتى يضعن حملهن﴾ ئێوە نەفەقەیان بکێشن و بەخێویان بکەن هەتا سکەکەیان دائەنێن، واتە: ئەگەر ژنە تەڵاقدراوەکە دووگیان بوو، ئەوە دووشتیان لەسەرتانە: جێگەی سکوونەت و، بەخێوکردن و نەفەقە ﴿فإن ارضعن لكم فآتوهن اجورهن﴾ ئینجائەگەر ئەو ژنە تەڵاقدراوانە - پاشدانانی منداڵەکە - شیریان بە منداڵەکانتان داو گۆشیانکردن، ئەوا حەق وکرێی خۆیان بدەنێ، واتە: ئەگەر ژنە تەڵاق دراوەکە داوای کرێیکرد، ئەبێ پیاوەکە کرێی شیرپێدانەکەی بداتێ ﴿واتمروا بينكم بمعروف﴾ دەشکرێ لەناوخۆتاندا بەشێوەیەکی جوان و پەسەند راوێژ بکەن و رێك بکەون ،ژنەکە بە رێك وپێکی شیرەکە بداو، پیاوەکەش کرێکەی بدات , واتە: کەسیان زیان بەمنداڵەکە نەگەیەنێت﴿وإن تعاسرتم فسترضع له اخرى﴾ خۆ ئەگەر یەکترتان تەنگەتاو کردو پێکنەهاتن,واتە: باوکەکە ئەوەندە کرێی نەئەدا، دایکەکەش داوای زیاتری ئەکرد,یان شیری پێ نەئەدا, ژنێکی تر شیر بەمنداڵەکە بدا ,دایەنی بۆ بگرێ و واز لەدایکـە تەڵاقدراوەکـە بێنـێ ﴿لينفـق ذو سـعة مـن سعته﴾ با دەوڵەمەنـدو دەسـەڵاتدار، بەپێی دەوڵەمەنـدی و دەسەڵاتەکەی خۆی ماڵ بەخت بکالە سەر تەڵاقدراوەکان و شـیردەرەکان ﴿ومـن قـدر عليـه رزقـه﴾ هەرکەسـیش دەستکورت و هەژاربوو ﴿فلينفق مما آتاه الله﴾ با لەوەخوا پێیداوە ببەخشێت, واتە زۆر لەخۆی نەکا، چەندە دەتوانێ ئەوەندە ببەخشێت ﴿لا يكلف الله نفسا إلا ما آتاها﴾ چونکە خـوا داوای بەخشـین لەکـەس ناکـات , بـەپێی ئـەوە نـەبێ پێیـداوە ﴿سـيجعل الله بعـد عسـر يسـرا﴾ بێگومـان پـاش سـەختی و تەنگانـە , خـوا خۆشـی دێـنی ودەرووی خێـر دەکاتەوە. تێبینی: ئایەتی (٦-٧):

١- بەرەوالـەت لـەوە دەچـێ کـە ژنـانی تەڵاقـدراو مـافی سوکنایان هەیەو پێویستە سوکنایان بۆ دابێن بکرێت.

٢- ژنیدووگیان هەتاسکەکەی دادەنێت, دەبێ نەفەقەی بکێشرێ، چونکە سەرقاڵە بە حەملی کابراکەوە.

٣- تەڵاقدراوی رەجعیی, لە حوکمی ژنی کابرای تەڵاقدەردایە، کەوابوو وەکو سوکنای واجیبە ئەبێ نەفەقەیشی بداتێ، بەڵێ وایە، بەڵام سەبارەت بە ژنی تەڵاقدراو بەتەڵاقی بائین, لای ئیمامەکان خیلاف وقسەی جیاواز هەیە: ئیمامی(شافیعی) - رەحمەتیخوای لێبێت- دەڵێ:حەقینەفەقەی نیە، چونکە پەیوەندی بە مێردەکەیەوە نەماوە. ئیمامی (ئەبووحەنیفە) - رەحمەتیخوای لێبێت - دەڵێت: حەقی نەفەقەی هەیە.

٤- ژنێ مێرد مردوو تەنها حەقی سوکنای هەیەو، هەقی نەفەقەی نیە، واتە:دەبێ لەوشوێنەدا بمێنێتەوە پێش جیابوونەوە تێیدابووە، مەگەر مانیعێکی شەرعیی هەبێ.

الجزء الثامن والعشرون ... سورة الطلاق

أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنتُم مِّن وُجْدِكُمْ وَلَا تُضَآرُّوهُنَّ لِتُضَيِّقُوا۟
عَلَيْهِنَّ ۚ وَإِن كُنَّ أُو۟لَٰتِ حَمْلٍ فَأَنفِقُوا۟ عَلَيْهِنَّ حَتَّىٰ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ ۚ
فَإِنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ ۖ وَأْتَمِرُوا۟ بَيْنَكُم بِمَعْرُوفٍ ۖ وَإِن
تَعَاسَرْتُمْ فَسَتُرْضِعُ لَهُۥٓ أُخْرَىٰ ٦ لِيُنفِقْ ذُو سَعَةٍ مِّن سَعَتِهِۦ ۖ
وَمَن قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُۥ فَلْيُنفِقْ مِمَّآ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ۚ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا
إِلَّا مَآ ءَاتَىٰهَا ۚ سَيَجْعَلُ ٱللَّهُ بَعْدَ عُسْرٍ يُسْرًا ٧ وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ
عَتَتْ عَنْ أَمْرِ رَبِّهَا وَرُسُلِهِۦ فَحَاسَبْنَٰهَا حِسَابًا شَدِيدًا وَعَذَّبْنَٰهَا
عَذَابًا نُّكْرًا ٨ فَذَاقَتْ وَبَالَ أَمْرِهَا وَكَانَ عَٰقِبَةُ أَمْرِهَا خُسْرًا ٩
أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا ۖ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ يَٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ۚ
قَدْ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيْكُمْ ذِكْرًا ١٠ رَّسُولًا يَتْلُوا۟ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ مُبَيِّنَٰتٍ
لِّيُخْرِجَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ۚ
وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ وَيَعْمَلْ صَٰلِحًا يُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا
ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۖ قَدْ أَحْسَنَ ٱللَّهُ لَهُۥ رِزْقًا ١١ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ
سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ وَمِنَ ٱلْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ يَتَنَزَّلُ ٱلْأَمْرُ بَيْنَهُنَّ لِتَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ
ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ ٱللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَىْءٍ عِلْمًۢا ١٢

٥٥٩

### شارو گوندێکی زۆر له خوا یاخیبوون وبەهیلاك چوون:

پاش بەکارهێنانی ئەو وشەی (تەقوا)یە لەم سوورەتەدا له نێوان باسکردنی ئەحکامەکاندا , دێتە سەرئەوەی که ئەگەر سەرپێچی بکەن, ئەوا وەك گەلانی رابردوویان بەسەر دێت: ﴿ [٨] و كأين من قرية عتت عن أمر ربها ورسله﴾ وزۆرێك لە ئاوایی‌و شارنشینەکانی پێشوو ,لەفەرمانی پەروەردگاریان یاخیبوون و، گوێرایەڵی پەیامبەرانیان نەکرد.

**روونکردنەوەیەك:** بیژەی (كأين) له هەر جێگایەکی قورئاندا هاتبیٚ بەمانای (كَمْ)ە، واته: بۆ (تكثير)ـە وەك بڵێی: زۆرێ، وەك دەفەرموێ: (وكأين من نبى قاتل). خەلیلی نەحویی زان ئەڵێ: (هى أى دخلت عليها كأن للتشبيه وبنيت معها فصار في الكلام معنى كم، صورت فى المصحف نونا...). بۆ ئەم روونکردنەوە دەتوانی سەیرێکی تەفسیری (قورتوبی) ئایەتی (١٤٦)ی آل عیمران بکەیت. ﴿فحاسبناها حسابا شديدا﴾ جائێمەش زۆر بەتوندیی لێمان پرسینەوە:سزای برسێتی و قات وقڕیی و، بەردەبارانمان پێچەژین ﴿وعذبناها عذابا نكرا﴾ وە بەسزایەکی توندودژوار ئازارماندان ﴿ [٩] فذاقت وبال أمرها﴾ ئەوسا سزای تاڵی کوفرو کاری خراپی‌خۆیانیان چەشت و گیرۆدەبوون ﴿وكان عاقبة أمرها خسرا﴾ وسەرەنجامی کارەکەشیان,واته: سەرپێچیەکەیان زیانێکی گەورەبوو بۆیان ﴿ [١٠] أعد الله لهم عذابا شديدا﴾ ولەپاشه رۆژیشدا خوا سزایەکی سەخت و توندی بۆ ئامادەکردوون ﴿فاتقوا الله يا أولى الألباب﴾ دەسا له نافەرمانی خوا بترسن ئەی هۆشمەندەکان! ﴿الذين آمنوا﴾ بەتایبەت ئەوانەتان که باوەڕیان هێناوه ﴿قد أنزل الله إليكم ذكرا﴾ بەڕاستی خوا قورئانیکی دابەزاندووە بۆتان، دەسا ئەبێ زیاتر هۆشیاربن ولەخوا بترسن و فەرمانەکانی ئەنجام بدەن.

### پێغەمبەر له تاریکییەکان دەرتاندێنێ:

﴿ [١١] رسولا يتلوا عليكم آيات الله مبينات﴾ وپەیامبەرێکی پایەبەرزی ناردووە ئایەتە روونەککرەوەکانی خواتان بەسەرا ئەخوێنێتەوە ﴿ليخرج الذين آمنوا وعملوا الصالحات من الظلمات إلى النور﴾ هەتا ئەوانەی باوەڕیان هێناوەو کارو کردەوەی چاکیان ئەنجامداوە,لەتاریکییەکانی کوفرو نەزانی وگومڕایی دەریان بێنێ بۆ رووناکی ئیمان ﴿ومن يؤمن بالله ويعمل صالحا﴾ وەهەرکەسێك باوەڕ بێنێ بە خواو کاری چاك ئەنجام بدات ﴿يدخله جنات تجرى من تحتها الأنهار﴾ خوا ئەیباتە باخەکانی بەهەشتەوە کە لە ژێر بنکی دارەکانیانەوە ئاوو و رووبار دێت ودەڕوا ﴿خالدين فيها أبدا﴾ بەهەمیشەییش تێیاندا ئەمێننەوە ﴿قد أحسن الله له رزقا﴾ بەڕاستیی خوا رزق و رۆزیەکی‌پاکی چاکی بۆفراوان دەکات لەبەهەشتدا.

### زانستی خوا دەورەی ئێوەی داوە:

﴿ [١٢] الله الذى خلق سبع سموات﴾ هەرخوا خۆیەتی حەوت ئاسمانەکانی فەراهەم هێنا ﴿ومن الأرض مثلهن﴾ و له زەویش وەك ئەوانی‌دروستکرد, واته: زەویش وەك ئاسمانەکان حەوت چینە! زانایان لەمە پێش ئەیانوت: زەویی تائەگاتە ناوەڕۆکەکەی حەوت چینە, بەڵام ئێستا ئەهلی عیلم ئەڵێن: شەش گۆێتر وەکو ئەم کورەیەی ئێمە هەیە و گیانلەبەرانی تێدا دەژیی و لە هەوڵی ئەوەدان بیاندۆزنەوە بەڵام لەڕاستیدا خوا خۆی چاك ئەزانێ، پێغەمبەریش ﷺ دەفەرمووێ: ((من ظلم قيد شبر من الأرض طوقه من سبع أرضين)) فتح البارى: ١٢٤/٥، مسلم: ١٢٣٢/٣. واته: ئەوی بەئەندازەی بستێك لە زەویی خەڵك داگیربکا، رۆژی قیامەت هەر حەوت نهۆمە زەوییەکە دەکرێ بە تەوق و دەکرێتە ملی ﴿يتنزل الأمر بينهن﴾ فەرمان وبڕیاری خوا لەنێوان ئەو ئاسمانانەدا دادەبەزێت ﴿لتعلموا أن الله على

كل شئ قدير﴾ تابزانن كەبەراستی ئەوخوایە دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێكدا هەیە و هەرچی بیەوێ ئەیكات ﴿وان الله قد احاط بكل شئ علما﴾ وەبێگومان زانست و زانیاریی ئەوخوایە دەورەی هەمووشتێكی داوە، واتە: ئاگاداری كاروباری بوونەوەرەو هیچ شتێكی لێناشارێتەوە، جاكەوابوو ئێوەیش زیاتر لەخوا بترسن وسنوورەكانی مەبەزێنن.

لە (٢٧)ی رەمەزانی (١٤١٧)ك بەرامبەر بە (١٩٩٧/٢/٥) پاش نوێژی بەیانی،

لە نووسینی ئەم سوورەتە بوومەوە.

*** *** ***

## ٦٦- سوورەتی ( تەحریم )ـە مەدەنییەو ( ١٢ ) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان



ئـەم سـوورەتە پـاش سـوورەتی (حوجـورات) هاتۆتـە خـوارەوە، لـە چـەند قەزیەیـەكی گـرنگ بـاس دەكـات كـە پەیوەندییان بەنێو ماڵی پەیامبەرو ﷺ و هاوسەرەكانیەوە هەیـە، بـاس دەكـات كـە پەیامبـەر ﷺ لەبـەر رازیكردنـی دڵیهەنـدێ لـە هاوسـەرەكانی،خاتوو (ماریـە)ی قیبتیـی لـەخۆی حـەرامكرد! پاشـان خـوا سـەبارەت بـەو كـارە كـە پێغەمبـەر ﷺ ئەنجامیـدا، گلـەیی لێـدەكاو دەفـەرموێ: نەدەبوو ئاواخۆت نارەحەت و تەنگەتاو بكەیت، ئینجا باسی خەتـەریی بڵاوكردنـەوەی كـارە نهێنیـەكانی نێـوان ژن و مێردەكـات! چـونكە ئەبێتـە هـۆی تێكچـوونی ژیـانی ژن ومێـرد.. بـەوەش نموونـە دێنێتـەوە كـە پەیامبـەر ﷺ نهێنیـەكی خـۆی لای خاتوونـە (حەفصـە) دركانـد، كەچـی ئـەویش دای بـەگوێی (خاتووعائیشـە)دا، لـە كاتێكـدا كـە پێغەمبـەر ﷺ بـە(حەفصـە)ی فـەرمووبوو:لای هـیچ كەسـێ نەیدركێنی، ئیتر دوایی قسەكە ماڵەوماڵ گەڕاو بووبە دەنگ و باسی ماڵان، بۆیە پەیامبەر ﷺ تووڕەبوو و خەشم و ركی لێهەڵساو نیازی تەڵاقدانی كرد!. هەر ئەم سوورەتە هێرشێكی سەخت دەكاتە سەر ئەوانە كەلەسەر شتێكی بچووك دڵی پەیامبەریان ﷺ رەنجان و نارەحەتیانكرد، كۆتاییشیبەهێنانی دوونموونە دێ: نموونەی ژنێكی كافرو بێ باوەڕ، ئەگەرچی لەژێر مارەیی و نیكاحی پیاوێكی صالح و موسڵماندابوو، بـەڵام ئـەو نزیكـی و پێكـەوە ژیانـەیان هـیچ كـەڵكێكی پێنەگەیانـد، وەنموونـەی ژنێكـی ئیماندارو موسڵمان، ئەگەرچی لەژێر ركێفی پیاوێكی خراپەكارو بێ باوەڕدا بوو، بەڵام لەبەر ئیمان ئەستووریی، كوفرو توغیانی مێردەكەی زیانی نەگەیاند پێی،وە لەدۆزەخ رزگارو سەر فراز بوو.

### ئەی پێغەمبەر! بۆ لەبەر دڵی ژنەکانت، حەڵاڵی خواحەرام دەکەیت؟!:

﴿بسم الله الرحمن الرحیم * [١] یاأیها النبی لم تحرم ما أحل الله لك﴾ ئەی پێغەمبەر! بۆچی شتێك لەخۆت حەرام دەکەیت ,خوا بۆی حەڵاڵ کردوویت,؟. راڤەکەرانی قورئان دەڵێن:پەیامبەر ﷺ کاتێ لەماڵی (حەفصە)خاندا دەبێت لەگەڵ (ماریە)ی هاوسەرییدا کۆئەبێتەوە، جا کە (حەفصە)خان گەڕایەوەو ئەوەی دیت، لێیکردەهەرا!! پەیامبەریش ﷺ ئەوەندە تەنگەتاوو نارەحەت بوو بەخاتوو (حەفصە)ی فەرموو: لێم مەکە بەهەراو، بۆ کەسیشی باس مەکە، ئەوا لەبەرخاتری تۆ (ماریە)م لەخۆم یاساغکرد! پاشان خاتوو (حەفصە)یش بۆخاتوو (عائیشە)ی گێڕایەوە! ئەوسا پێغەمبەر ﷺ سوێندی خوارد کە بۆماوەیەك لەهیچیان نزیك نەبێتەوە، جاپاش (٢٩) رۆژ ئایەتی: (یا أیها النبی لم تحرم ما أحل الله لك) هات. (دارە قوتنیی) ریوایەتیکردووە. بەڵام (ئیبن کەسیر) ئەو ریوایەتە بە بەهێزو پەسەندتردادەنێ کە باسی خواردنی هەنگوێنەکە دەکا، چونکە ڕای جەماوەری زانایانی لەسەرە. ﴿تبتغی مرضات أزواجك﴾ دەتەوێ ژنەکانت (حەفصە وعایشە) رازی بکەیت! ﴿والله غفور رحیم﴾ لەکاتێکدا خوا زۆر لێبوردەی میهرەبانە، نابینی تۆ ژنەکان لەخۆ قەدەغە دەکەیت! خواش مۆڵەتت دەدا لات بمێننەوەو کەفارەتی سوێندەکەت بدەیت ﴿[٢] قد فرض الله لکم تحلة ایمانکم﴾ بە راستیی خوا هەڵوەشاندنەوە و کردنەوەی سوێندەکانتانی بەکەفارەت بۆشەرعاندن، ئەوسا پەیامبەریش ﷺ لەکەفارەتی سوێندەکەیدا بەندەیەکی ئازاد کرد ﴿والله مولاکم﴾ وخواش گەورەو یارمەتیدەرتانە ﴿وهو العلیم الحکیم﴾ هەرئەویشە زانای کارزان، هەموو شتێك بەپێی بەرژەوەندیی بەندەکانی خۆی دەکات.

### دەبێ ژنان نهێنی مێردیان بپۆشن:

﴿[٣] وإذ أسر النبی إلی بعض أزواجه حدیثا﴾ ئەودەمەش کە پەیامبەر ﷺ قسەیەکی نهێنیلای هەندێ لە ژنەکانی(واتە:لای خاتوو حەفصە) درکاندوو پێیگوت: وا لەبەر تۆ (ماریە)م لەخۆم یاساغکرد، دەساتۆش بڵاوی مەکەوە! ﴿فلما نبأت به﴾ جا کەخاتوو (حەفصە) هەواڵەی گەیاندە خاتوو عائیشە ﴿وأظهره الله علیه﴾ و خوایش پێغەمبەری لێ بەئاگاکردو تێیگەیاند کە: (حەفصە) نهێنیەکەتی باسکردەوە ﴿عرف بعضه وأعرض عن بعض﴾ پێغەمبەر ﷺ هەندێکی بۆخاتوو (حەفصە) باسکردو, رووی لە هەندێکی وەرگێڕاو باسی نەکرد و خۆی لێبێ ئاگا کردو نەیدایەوە بەروویدا، چونکە پیاوە هەڵکەوتووەکان زۆرجار لەهەندێ شت خۆیان بێ ئاگادەکەن وورووشکێنی ناکەن، عەرەب چەندجوان ئەڵێ: (ما زال التغافل من شِیَم الکرام) یان دەڵێن: (مااستَقْصی کریم قَطُّ) واتە: هەرگیز پیاوی شەرەفمەند بە دوایهەموو شتێکدا ناچێت! ﴿فلمانبأها به﴾ ئینجا کە (حەفصە)ی لێ تێگەیاندو پێیگوت: تۆقسەی منت بردۆتە دەرێ ﴿قالت من أنبأك هذا﴾ بەسەر سوڕمانێکەوە گوتی: باشە کێ ئەم هەواڵەی پێگەیاندیت؟! پێی وابوو خاتوو عائیشە بووە! ﴿قال نبأنی العلیم الخبیر﴾ پەیامبەر ﷺ فەرمووی: پەروەردگاری زانای بەئاگا لەتەواوی نهێنیەکان ئاگادارکردووم.

### ژنان نابێ شووەکانیان تەنگەتاو بکەن:

پاش ئەوەکە پێغەمبەرئازارو بێزارێکی زۆردرا لە لایەن هاوسەرەکانیەوە، خوای میهرەبان رێگای تەوبەو پەشیمانیدەخاتە بەردەم خێزانەکانیو پێیان دەفەرموێ:﴿[٤] إن تتوبا إلی الله﴾ ئەگەر ئێوە (ئەی حەفصەو، عائیشە!) تەوبە بکەن لایخواو لەو هەڵس وکەوتەیە پەشیمان ببنەوە،دیارە کارێکی باشتان ئەنجامداوەو، خۆتان لە تووڕەیی خوا لاداوە ﴿فقد صغت قلوبکما﴾ چونکە بەراستیی بەرامبەر بەدڵسۆزی بۆ پەیامبەر ﷺ دڵتان لە هەق لایدا ﴿وإن

**تظاهرا عليه﴾** وە ئەگەر پشتگیری یەکتر بکەن لە دژی پێغەمبەر, چاك بزانن كە هیچتان پێناکرێ ودەرەقەتی نایەن ﴿**فإن الله هو مولاه**﴾ ئەو بەراستیی خوا خۆی پشتیوانیەتی ﴿**وجبريل وصالح المؤمنين**﴾ هەروا جبریل و بڕوادارەچاکەکانیش، وەکو (ئەبوبەکرو عومەر) ﴿**والملائكة بعد ذلك ظهير**﴾ وفریشتەکانیش – سەرەڕای خواو جوبرەئیل و ئەبوبەکرو عومەر– هەر هاوکار وپشتیوانن بۆی ﴿[٥] **عسى ربه إن طلقكن**﴾ ئەگەر پەیامبەر ﷺ بڕیاری تەڵاقدانتان بدات ,ئەوا دڵنیابن خوا ﴿**أن يبدله أزواجا خيرا منكن**﴾ کە لەجیاتی ئێوە ژنانی باشتری پێببەخشێت ﴿**مسلمات**﴾ ژنانیموسڵمان و ملکەچ ﴿**مؤمنات**﴾ وباوەڕدار ﴿**قانتات**﴾ وبەرفەرمان و گوێڕایەڵ ﴿**تائبات**﴾ و تەوبەکارو گەڕاوە لە کوفرو شیرك ﴿**عابدات**﴾ وعیبادەتکارو خواپەرست ﴿**سائحات**﴾ و ڕۆژووگر، یان گەشتوگەڕکارو کۆچکەر بۆلای خواوپەیامبەر ﷺ، یان بۆهەرجێگایەك کەپێویست بێ کۆچی بۆبکەن ﴿**ثيبات وأبكارا**﴾ لە بێوە ژن و کیژان، بەکورتیی: ئەر ئێوە ئەوەندە دەردەسەری ئەو بدەن و، تەنگەتاوی بکەن، لەوانەیە تەڵاقتان بداو، لێتان جیا ببێتەوە، دیارە ئەوکاتەش خوای گەورە چەند ژنێکی زۆر باشتر لە ئێوەی دەداتێ.. دەسا بەوبارەگرژییو ئاڵۆزییە کۆتایی بێنن.

### خاوو خێزانتان لە ئاگری دۆزەخ بپارێزن:

ئینجا بە شێوەیەکیگشتیی ئامۆژگاری ئیمانداران و موسڵمانان دەکا و ئەفەرموێ: ﴿[٦] **يا أيها الذين آمنوا قوا أنفسكم وأهليكم نارا**﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! خۆتان وژن ومال و کەس وکارەکەتان بپارێزن لەئاگرێك ﴿**وقودها الناس والحجارة**﴾ سووتەمەنیەکەی جەستەولاشەی مرۆی کافروبەردی گۆگردە، یان ئەو بەردانەن خەڵکیدەیپەرستن، مەبەست ئەوەیە کە زۆر بڵێسەدارو بەگڕو گەرمە، وەك ئاگری ئەم دنیا نیەکە تەنها بەداروبە چیلکە هەڵگیرسێ، بەڵکو ئەوبە بەرد زیاتر گڕدەگرێ و بڵێسە ئەسێنێ! بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەرکەمناڵان گەیشتنە حەوت ساڵان، نوێژیان پێ بکەن، خۆ ئەگەر گەیشتنە دەساڵە ونەیانکرد، دەبێلەسەر ئەوە لێیان بدەن.پێشەوا ئەحمەد: ٣/٤٠٤، تحفة الأحوذي: ٢/٤٤٥. ﴿**عليها ملائكة غلاظ شداد**﴾ کۆمەڵە فریشتەیەکی زبرو توندو تیژ بەسەریەوەن، هەر چەندە داوای بەزەییان لێبکرێ کەڵکی نیە ﴿**لا يعصون الله ما أمرهم**﴾ نافەرمانی خوا ناکەن لە هەرشتێك فرمانیان پێبکا ﴿**ويفعلون ما يؤمرون**﴾ وهەرفرمانێکیشیان پێ بسپێرێ ,بە خێرایی ئەنجامی دەدەن. بەڵێ..بەرپرسێتی بەرامبەر بەخزم وکەس وکارو منداڵ وژن ,بنەمایەکی زۆر گرنگە لە دیدیئیسلامدا، بۆیە پێغەمبەری ئازیزمان(محمد) ﷺ ئەفەرموێ: ((كُلُّكمْ راعٍ وكلكم مسؤلٌ عن رعيته، فالإمام الذى على الناس راعٍ وهو مسؤلٌ عنهم، و الرجلُ راعٍ على أهل بيته وهو مسؤلٌ عنهم)) متفق عليه. واتە: بەرامبەر بە خوارتر لەخۆتان،هەموو شوان و بەرپرسن، دیارە هەریەکەش – هەر لەشوانێکەوە تا ئەمیرو سەرکارێك – دەبێ بە ئەندازەی دەسەڵاتیخۆی ئەرکەکانی سەرشانی خۆی ئەنجام بدات.

### ڕۆژی سەلا بڕووبیانووی خوانەناس وەرناگیرێ:

﴿[٧] **يا أيها الذين كفروا لا تعتذروا اليوم**﴾ ئەی ئەوانەی کافرو بێبڕوابوون! ئەمڕۆ (ڕۆژی قیامەت) بڕو بیانوو مەهێننەوە بۆ تاوانەکانتان، چونکە هیچ بیانوویەکتان لێ وەرناگیرێ ﴿**إنما تجزون ما كنتم تعلمون**﴾ بەڕاستی تەنها بەپێیئەو کارو کردەوانە پاداش دەدرێنەوە کردووتانن.

**بەراست و بە هەق بگەڕێنەوە بەرەو خوا :**

بەهۆی ئەوگیرو گرفتەوە لەناو خێزانەکانی پێغەمبەردا ﷺ روویدا, خوا باسی پەشیمان بوونەوە ئەکاو دەفەرموێ: ﴿[8] یاأیهاالذین آمنوا توبوا إلى الله توبة نصوحا﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! بگەڕێنەوە بۆلای خوا بەتەوبەو گەڕانەوەیەکی ئیجگاری، واتە:بەشێوەیەك,ئیتر جارێکی تر نەگەڕێنەوە سەر ئەو تاوان و گوناهانە, لەپێشەوا (عومەر)یان پرسی: تەوبەی (نەصووح) چیە! فەرمووی: تەوبەی (نەصووح) ئەوەیە کە ئەو کەسە تاوانکارە لە تاوانکانیپەشیمان ببێتەوەو جارێکیتر نەگەڕێتەوە سەریان، چۆن شیر هەرکە لەگوانیئاژەڵەکە هاتەدەر, جارێکی تر ناگەڕێتەوە بۆگوانی ئاژەڵەکە ﴿عسى ربكم ان يكفر عنكم سيئاتكم﴾ دڵنیابن - ئەگەر تەوبەی ئاوا بکەن -پەروەردگارتان لەگوناهەکانتان خۆش دەبێت ﴿ويدخلكم جنات تجرى من تحتها الأنهار﴾ و دەتانباتە ناو چەندین باخی بەهەشتەوە کە لەژێر بنکیدارو درەختەکانیانەوە ئاوو رووبار بەخوڕم دەڕوات ﴿يوم لا يخزى الله النبى والذين آمنوا معه﴾ لەو ڕۆژەدا (ڕۆژی قیامەت) خوا پەیامبەرو ئەوانەی باوەڕیان هێناوە ریسواو سەرشۆڕ ناکات ﴿نورهم يسعى بين أيديهم وبأيمانهم﴾ لەبەردەمیانەوەو لە لای راستیانەوەبەسەر پردی (صراط)دا پێی دەڕۆن ﴿يقولون ربنا أتمم لنا نورنا﴾ ودەڵێن:پەروەردگاری ئێمە! نوور ورووناکییەکەمان بۆ تەواوبکەو بەردەوامبێت ﴿واغفر لنا﴾ و لێمان خۆش ببە ﴿إنك على كل شئ قدير﴾ بە راستیی تۆ بەسەر هەموو شتێکدا بە توانایت. پێغەمبەریش ﷺ ئەفەرمووێ: ((اللهم لا تخزنى يوم القيامة)) ئەحمەد: ٤/٢٣٤. خوایە! لەڕۆژی قیامەتدا ئابڕوم نەچێت.

سُورَةُ التَّحْرِيمِ — الجزء الثامن والعشرون

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ تُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ تَوْبَةً نَّصُوحًا عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يُكَفِّرَ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَيُدْخِلَكُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ يَوْمَ لَا يُخْزِى ٱللَّهُ ٱلنَّبِىَّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ نُورُهُمْ يَسْعَىٰ بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَٰنِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَتْمِمْ لَنَا نُورَنَا وَٱغْفِرْ لَنَآ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ جَٰهِدِ ٱلْكُفَّارَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱغْلُظْ عَلَيْهِمْ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٩﴾ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱمْرَأَتَ نُوحٍ وَٱمْرَأَتَ لُوطٍ كَانَتَا تَحْتَ عَبْدَيْنِ مِنْ عِبَادِنَا صَٰلِحَيْنِ فَخَانَتَاهُمَا فَلَمْ يُغْنِيَا عَنْهُمَا مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا وَقِيلَ ٱدْخُلَا ٱلنَّارَ مَعَ ٱلدَّٰخِلِينَ ﴿١٠﴾ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱمْرَأَتَ فِرْعَوْنَ إِذْ قَالَتْ رَبِّ ٱبْنِ لِى عِندَكَ بَيْتًا فِى ٱلْجَنَّةِ وَنَجِّنِى مِن فِرْعَوْنَ وَعَمَلِهِۦ وَنَجِّنِى مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١١﴾ وَمَرْيَمَ ٱبْنَتَ عِمْرَٰنَ ٱلَّتِىٓ أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا فَنَفَخْنَا فِيهِ مِن رُّوحِنَا وَصَدَّقَتْ بِكَلِمَٰتِ رَبِّهَا وَكُتُبِهِۦ وَكَانَتْ مِنَ ٱلْقَٰنِتِينَ ﴿١٢﴾

٥٦١

**لەگەڵ خوانەناس و دوورازییدا بجەنگە :**

﴿[9] یاأیهاالنبى جاهد الكفار والمنافقين﴾ ئەی پەیامبەر! ﷺ بەشیرلە گەڵ کافراندا بجەنگەو,بەبەڵگەش لە گەڵ دووڕووەکاندا ئاخافتن بکە ﴿واغلظ عليهم﴾ و توندو تیژبە لەسەریان ,بەشکو شەوکەتیان بشکێ ﴿ومأواهم جهنم﴾ جێ وئەنواشیان دۆزەخە ﴿وبئس المصير﴾ وخراپ جێگایە دۆزەخ بۆ تاوانباران.

**ئیمانی ئیماندار کەڵکێ بە کافر نادا :**

﴿[10] ضرب الله مثلا للذين كفروا امرأة نوح وامرأة لوط﴾ خوا نموونەیەك دەهێنێتەوەبۆ بێ باوەڕەکان بە ژنەکەی (نووح) و ژنەکەی (لووط), هەتا تێبگەن کە هەرچەندە تێکەڵ و نزیك بن لە موسڵمانانەوە کەڵك وەر ناگرن ﴿كانتا تحت عبدين من عبادنا صالحين﴾ کە لە ژێرنیکاحی دوو بەندەدابوون لە بەندە صالح وچاکەکانی ئێمە , واتە:(نووح)و(لووط) سەلامیخوایان لەسەر بێت ﴿فخانتاهما فلم يغنيا عنهما من الله شيئا﴾ جا گزیی و خیانەتیان

پێکردن، له ئەنجامدانی کاروباری ئایینی خوادا, لەبەر ئەوە دوو پەیامبەرەکەش نەیانتوانی شتێك لەسزای خوایان لێدوور بخەنەوە. (سید قطب) ئەڵێ: خیانەتی ئەودوو ژنە خیانەت بوو لەبانگەوازی ئەو دووپەیامبەرەو، بڕوا نەهێنانیان بووپێیان، نەك شەرواڵ پیسیی وکاری دزێو، وەك ئەم وئەو دەڵێن!چونکە ژنەکەی نووح هەروەك خەڵکانیتر گاڵتەی بەنووح وبە موسڵمانەکان ئەکرد! ژنەکەی (لووط) یش خیانەتی لەمیوانەکانی دەکرد، هەردەم وکاتێ میوانێکی هاتبا، ئەو بەپەلە هەواڵی بەخەڵکیشارەکە ئەدا. (ئیبن عەبباس) ﷺ ئەڵێ: (مابغت امراة نبی قط) هیچ ژنە پەیامبەرێك قەت زیناو شەرواڵ پیسی نەکردووە، (تەبەری)یش لەتەفسیری (فخانتاهما)دا دەڵی: (أی: فی الدين) واتە:خەیانەتەکەیان لەکاروباری دینداریدا بوو,نەك لە مەسەلەی ئەخلاقدا. ﴿ وقيل ادخلا النار مع الداخلين﴾ دەرەنجام لەقیامەتدا پێیان دەوترێ: دەسابچنە ناو ئاگری دۆزەخەوە لەگەڵ ئەوانەدا دەچنە ناویەوە،جاکەوابوو هیچ جۆرە نزیکییەك لەپیاوچاکانەوە- ئەگەرچی پەیامبەریش بن,بێئیمان وباوەڕ -کەڵك نابەخشێ. دەسائێوەش ئەی هاوسەرانی پەیامبەر ﷺ! دەست لە ئەزیەت و ئازاری پەیامبەر هەڵگرن، بەوە مەنازن کە هاوسەری ئەون.

**کوفری کافر زیان نادا له ئیمانی ئیماندار:**

﴿ [11] وضرب الله مثلا للذين آمنوا امراة فرعون﴾ هەروەهاخوا نموونەیەك بە ژنەکەی فیرعەون (ئاسیە)ی کچی (مزاحم) دێنێتەوە بۆئەوانەی باوەڕیان هێناوە,ئەو ژنەئیمانداره هەرچەندەنزیکی فیرعەون بوو، بەڵام فیرعەون هیچ سوودو کەڵکێکی لە باوەڕەکەی وەرنەگرت و، ئەمیش چونکە ناچاربوو کوفری فیرعەون زیانی بە ئیمانەکەی نەگەیاند ﴿ إذ قالت رب ابن لی عندك بيتافی الجنة﴾ کاتێ وتی: پەروەردگارەکەم! لای خۆت لە بەهەشتداماڵێکم بۆ دروست بکە ﴿ ونجنی من فرعون وعمله﴾ وە لە دەست فیرعەون و کردەوەکانی ڕزگارم بکە ﴿ ونجنی من القوم الظالمين﴾ وە لە دەست ئەو هۆزە ستەمکارانەش رزگارم بکە.

**مەریەم شەرمی خۆی له حەرام پاراست:**

﴿ [12] ومريم ابنت عمران التی احصنت فرجها﴾ وە خوا نموونەیەمی تر دێنێتەوە بەمەریەمی کچی(عیمران) ئەو ژنەی داوێنی خۆی پاراست لە حەرام ﴿ فنفخنا فيه من روحنا﴾ ئینجا ئێمەش لەرێیئەو (ڕوح)ـەی خۆمانەوە (جوبریل) فوومان پیاکرد و دوو گیان بوو بە عیسا سەلامی لە سەربێ. (قال المفسرون): إنه أراد بالفرج هنا الجيب.. لأنه قال: ونفخنا فيه من روحنا، و جبريل عليه السلام إنما نفخ فی جيبها ولم ينفخ فی فرجها). ﴿ وصدقت بكلمات ربها وكتبه﴾ وە ئەویش دداننا بە هەموو وتەو فەرمانەکانی خواو کتێبەکانیدا ,ئەوانەی ناردبوونی بۆپەیامبەرانی پێشین ﴿ وكانت من القانتين﴾ وە بەردەوام لە ریزیخەڵکانی فەرمانبەرداردا بوو، هەزاران هەزار سڵاوی لێبێت. لە فەرمودەیەکدا هاتووە کە ئیمامی (بوخاریی) و ئیمامی (موسلیم) هێناویانە: ((كمل من الرجال كثير، ولم يكمل من النساء إلا آسية امراة فرعون، ومريم آبنت عمران، وخديجة بنت خويلد، وإن فضل عائشة على النساء كفضل الثريد على سائر الطعام)) فتح الباری: ٦/٥١٤، مسلم: ٤/١٨٨٦- واتە: خەڵکێکی زۆر لەپیاوان پێگەیشت وکامڵ بوون، کەچی لە ژنان تەنها ئەم چوار ژنە گەیشتنە کەماڵ: ئاسیەی ژنی فیرعەون، مەریەمی کچی عیمران، خەدیجەی کچی خوەیلد،وەفەزڵ و ڕێزی (عائیشە)یش بەسەر ژنانی تردا وەك فەزڵی (تشريب) وایە بەسەرتەواوی خواردنەکانی تردا ,دیارە ئەوخواردنە لای عەرەبەکان زۆرخۆش و بەحورمەت بوو.

سوپاسی بێپایان بۆ خوای دلۆڤان, لەبەرامبەر تەواو کردنی تەفسیری سوورەتی (تەحریم)ەوە.

کۆتایی جزمی بیست و هەشت - و لله الحمد و المنة.

## ٦٧- سوورەتی ( مولك )ـە

## مەككەییەو ( ٣٠ ) ئایەتە

### بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتە پاش سورەتی (طور) هاتووە، ئەمیش وەك سوورەتە مەككەییەكانی تر،باسی‌ئیمان و بیرو باوەڕو ئایدۆلۆژی ئیسلامیی دەكات، جگەلەوەش لەسێ شتی زۆرگرنگ و سەرەكیی ئەدوێ ، وەكو: گەورەیی و دەسەڵاتی بێ سنوری خوا.. هێنانەوەی چەند بەڵگەیەك بۆ یەكخواپەرستیی، دەرئەنجام وپاشە ڕۆژی بێ باوەڕان و، ئەوانەی ململانێ و ئینكاری زیندوو بوونەوە دەكەن. بۆ یەكەمجار دەڵێت: تەنها خوا بەرزە، بڵندە، خاوەن دەسەڵاتە، باڵادەستە، چاود یری بونەوەرە، وە ئەومردن و ژینەش كەهیچ كەسێك وەك پێویست پەی پێ نەبردوون،هەربەفرمان و بڕیاری ئەون.. ئینجا باسی بەدیهێنان و دروستكردنی ئاسمانەكان دەكات، ڕازاندنەوەی ئەم ئاسمانەی نزیكمان بەچەندین چراو ئەستێرەی پرشنگدار.. وە لەپاشەڕۆژ و حاڵی تاوانباران دەدوێ، ئەو كاتەی كە دۆزەخ بە چاوی خۆیان دەبینن و چۆنیش لە ڕقا- بەرانبەر بە دوژمنانی خوا-خۆی دەخواتەوەو خەریكە لەت لەت ببێ..!! لەگەڵ هەڵسەنگاندن و بەراوردێكیشدا لە نێوان پاشەڕۆژی بڕواداران و بێ بڕوایاندا.

بێداریی وهۆشیاری ئەدات كە تاخوا قاری لێ نەگرتوون بكەونە خۆ. كۆتایی دێت بە هەرە شەكردن لەوانەی كە ململانێ و چەلەحانێ دەكەن لەگەڵ پەیامبەردا ﷺ. جائەم سورەتە هەروەك پێی دەڵێن سوورەتی (مولك) پێیشی دەڵێن: (الواقیة، المنجیة) چونكە هەر كەسێك بەدڵسۆزییەوە بیخوێنێ، ئەوا لە سزای گۆڕ خوا ڕزگاری دەكات. پەیامبەریش ﷺ دەفەرموێ: ((هی المانعة، وهی المنجیة، تنجی من عذاب القبر)) ترمزی. وە هەروەها لەڕۆژی قیامەتدا تكا بۆخوێنەرەكەیشی دەكا، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((من القرآن ثلاثون آیة شفعت لرجال حتی غفرله، وهی: تبارك الذی بیده الملك)). ئەبووداود.

الجزء التاسع والعشرون | سورة الملك

سُورَةُ المُلْكِ — ترتيبها ٦٧ — آياتها ٣٠

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

تَبَٰرَكَ ٱلَّذِى بِيَدِهِ ٱلْمُلْكُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١﴾ ٱلَّذِى خَلَقَ
ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفُورُ ﴿٢﴾
ٱلَّذِى خَلَقَ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ طِبَاقًا مَّا تَرَىٰ فِى خَلْقِ ٱلرَّحْمَٰنِ مِن
تَفَٰوُتٍ فَٱرْجِعِ ٱلْبَصَرَ هَلْ تَرَىٰ مِن فُطُورٍ ﴿٣﴾ ثُمَّ ٱرْجِعِ ٱلْبَصَرَ كَرَّتَيْنِ
يَنقَلِبْ إِلَيْكَ ٱلْبَصَرُ خَاسِئًا وَهُوَ حَسِيرٌ ﴿٤﴾ وَلَقَدْ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ
ٱلدُّنْيَا بِمَصَٰبِيحَ وَجَعَلْنَٰهَا رُجُومًا لِّلشَّيَٰطِينِ وَأَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابَ
ٱلسَّعِيرِ ﴿٥﴾ وَلِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِرَبِّهِمْ عَذَابُ جَهَنَّمَ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ
﴿٦﴾ إِذَآ أُلْقُوا۟ فِيهَا سَمِعُوا۟ لَهَا شَهِيقًا وَهِىَ تَفُورُ ﴿٧﴾ تَكَادُ تَمَيَّزُ
مِنَ ٱلْغَيْظِ كُلَّمَآ أُلْقِىَ فِيهَا فَوْجٌ سَأَلَهُمْ خَزَنَتُهَآ أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ ﴿٨﴾
قَالُوا۟ بَلَىٰ قَدْ جَآءَنَا نَذِيرٌ فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ مِن شَىْءٍ إِنْ أَنتُمْ
إِلَّا فِى ضَلَٰلٍ كَبِيرٍ ﴿٩﴾ وَقَالُوا۟ لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِىٓ أَصْحَٰبِ
ٱلسَّعِيرِ ﴿١٠﴾ فَٱعْتَرَفُوا۟ بِذَنۢبِهِمْ فَسُحْقًا لِّأَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١١﴾
إِنَّ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِٱلْغَيْبِ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ ﴿١٢﴾

وَأَسِرُّوا۟ قَوْلَكُمْ | ٥٦٢

### مەزنایەتی خواو، دروستكردنی مردن و ژیان و، ئاسمان و هەسارەكان:

﴿بسم الله الرحمن الرحیم * [1] تبارك الذی بیده الملك﴾ بەرزە، بڵندە، گەورەیە ئەو زاتەی دەسەڵاتی هەموو بونەوەری بەدەستە ﴿وهو علی كل شئ قدیر﴾ وهەرئەویشە تواناودەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێكدا هەیە. پاشان برێك لە ئاسەواری دەسەڵاتی خوا باس دەكاودەفەرموێ:﴿[2] الذی خلق الموت والحیاة﴾ ئەوخوایە كە مردن و ژیانی دروستكرد, ئەوەتە هەندێ ئەژێینێ، هەندێ ئەمرێنێ, خۆ مردنیش گواستنەوەیە لەجێگایەكەوە بۆ جێگایەكی تر، پاشان لەجێگای دووەمدا ژیانێكی نوێ دەست پێ ئەكاتەوە ﴿لیبلوكم ایكم احسن عملا﴾ بۆئەوەی تاقیتان بكاتەوە

کامەتان کارو کردەی چاکترو باشترە، پاشانیش بەپێی ئەوە پاداش وەرگرێتەوە, واتە: تاقیدەکرێنەوە بۆ ئەوە کە خۆی و خەڵکانی تر بزانن لە ئاییندەدا چ کارێ ئەنجام ئەدات. لە سوورەتی (٥٦:٥١):(وما خلقت الجن والإنس إلا لیعبدون).یان سوورەتی: (٧/١١): (لیبلوکم أیکم احسن عملا..). هەمان مەبەست دوویات دەکەنەوە ﴿وهو العزیز الغفور﴾ وە تەنها ئەوە دەسەڵاتدار, (ئەتوانێ تۆڵە لە هەموو کەسێك وەر بگرێ, زۆریش گوناحپۆش و لێبوردەیە, بۆ هەر کەسێك تەوبە بکاو پەشیمان بێتەوەو بگەڕێتەوە بۆلای. ئینجا هەندێ تر لەدەسەڵاتی خوا لەم جیهان و بوونەوەرەدا باسئەکا، بۆیە ئەفەرمووێ: ﴿[٣] الذی خلق سبع سموات طباقا﴾ ئەو خوایەی کە حەوت ئاسمانی لەسەریەك وچین چین – لەگەڵ بەدیهێنانی هێزی راکێشەر لە نێوانیاندا– دروستکرد, بێ هیچ جۆرە هۆیەك کە من و تۆ پێی بزانین, خاوەنی (فی ظلال) دەڵێت: ناتوانی بڵێیت ئەو حەوت ئاسمانە بەو جۆرەن و بەو شێوەیەن، یان لە فلانە شتن..! وە نابێ ئێمە بەدوای تیوورو بینییەی گەردونناسەکاندا برۆین، چونکە ئەو جۆرە تیوورانە هەمووکات دەست ئەدەن بۆ گۆڕان ودەستکاریی و، بۆچونێکی نوێ، بەتایبەت رۆژ بەرۆژ پشکاندن و دەرخستن زیاتر دەبێت، ئەمرۆ شتێك دەڵێن، بەیانی شتێکی دیکە، جا لەبەر ئەوە نابێ و رەوا نییە قورئان ببەسرێت بەو جۆرە بۆ چوونانەوە.. وە تەنها ئەوەندە بەسە کە لە تەفسیری (سبع سموات)دا بڵێین: حەوت چین ئاسمانن بەڵام بێ شیکردنەوە ﴿ما تری فی خلق الرحمن من تفاوت﴾ لەناو دروستکراوەکانی (خوای) بە بەزەییدا هیچ جۆرە نارێکی و ناتەواوییەك نابینی, بەڵکو لەو پەڕی قایمی و مەحکەمییان، جوانیی و، رێك و پێکیی و، بێ عەیبیی و, ئەم قەشەنگی ئاسمانانە و دەسەڵاتی بێ وێنەی خوای بە بەزەیی لەچەند ئایەتێکی تردا باس کراوە، وەك: (أفلم ینظروا إلی السماء فوقهم کیف بنیناها وزیناها ومالها من فروج)، (٦:٥٠).یان دەفەرموێ: (صنع الله الذی أتقن کل شئ)(٨٨:٢٧). یان دەفەرموێ: (الذی احسن کل شئ خلقه..(٧:٣٢). بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو رێك و پێکیەدا پێش هاتنی قیامەت تێك دەچێت، وەك دەفەرموێ: (إذا السماء إنفطرت).یان دەفەرموێ: (إذا السماء انشقت)،یان دەفەرموێ: (یوم تشقق السماء بالغمام).

﴿فارجع البصر هل تری من فطور﴾ جا ئەگەر گومانێکت لەوەدا هەبێ وتمان, چاو بگێڕەو ببینە، بزانە هیچ قلیشێك دەبینی..؟ ﴿[٤] ثم ارجع البصر کرتین﴾ پاشان جار لە دوای جارچاوت بگێڕەوبنوارە ﴿ینقلب إلیك البصر خاسئا﴾ سەرەنجام ملکەچ دەبی و چاوت بە زەبوونی دەگەڕێتەوە وهیچ ناتەواوییەك نادۆزێتەوە ﴿وهو حسیر﴾ و زۆر شەکەتەوهیچ کەم و کوڕییەکیشی چاو نەکردووە ﴿[٥] ولقد زینا السماء الدنیا بمصا بیح﴾ وەبە ڕاستی ئێمە ئەم ئاسمانە نزیکەمان بە چەندین چرای پرشنگدار(ئەستێرەکان) ڕازاندۆتەوەو زەویشمان پیڕۆشن کردوونەتەوە، بەتایبەت لە شەوە تاریکەکاندا سەیر بکەن ﴿وجعلناها رجوما للشیاطین﴾ وتیربارانی شەیاتینەکانیشیان پێدەکەین, ئەوانەی وا لەسنوور دەردەچن و ئەیانەوێ نهێنیەکانی بونەوەر لە دەم فریشتەوە وەرگرن و، پاشان مەردمی پێ چەواشە بکەن.. واتە:هەرکات ویستبێتیان نزیك ببنەوە، ئێمە بە پزیسکی ئەستێرەکان سوتاندومانن، وە لە ئایەتی (ولقد جعلنا فی السماء بروجا وزیناها للناظرین و حفظناها من کل شیطان رجیم، إلا من استرق السمع فأتبعه شهاب مبین) (١٥/١٦-١٨. جەخت لە سەرئەوحەقیقەت و راستیە کراوەتەوە. ﴿وأعتدنا لهم عذاب السعیر﴾ وەسزای سووتێنەریشمان لەپاشەرۆژدا بۆ ئامادەکردوون.

**جەهەننەم نێلدراوە بۆ جەهەننەمییەکان:**

﴿٦ وللذين كفروا بربهم عذاب جهنم﴾ بۆ ئەوانەش بە پەروەردگاریان کافر و بێباوەڕ بوون ، سزای دۆزەخ هەیە﴿وبئس المصير﴾ کەجێگایەکی زۆرخراپە دۆزەخ ﴿٧ إذا القوا فيها سمعوا لها شهيقا﴾ کاتێ کە فرێدەدرێنە نێویەوە دەنگێکی زۆرناساز وناخۆشی لێ ئەبیسن. (ئیبن عەباس) ئەڵێ: هێستر کاتێ کەجۆی دەدرێتێ پرمە و دەنگێکی لێ دەبیسرێ، دۆزەخیش ئەودەمەی کەکافران فرێ دەدرێنە نێویەوە هەمان دەنگ و پرمەی هەیە، ئەوەیە پێی ئەڵێن (شەهیق) ﴿وهى تفور﴾ لەکاتێکدا بەوانیشەوە قوڵپ دەدا و هەڵدەچێ و دەکوڵێ مەنجەڵ ﴿٨ تكاد تميز من الغيظ﴾ لەداخی کافراندا خەریکە لەت لەت ببێ و، لەیەك بێتەوە. بەڵێ ئەم ئایەتانەو چەندین ئایەتی تر روونی دەکەنەوە کەئاگر هەست و پێزانینی هەیەو، داواو داخوازیش دەکات، وەك فەرمایشتی: (إذا رأتهم من مكان بعيد سمعوا لها تغيظا وزفيرا)(١٢/٢٥).یان دەفەرموێ: (يوم نقول لجهنم هل امتلات وتقول هل من مزيد) (٥٠/٣٠). ﴿كلما القى فيها فوج﴾ هەردەستە وتاقمێك لەبێ باوەڕان کە فرێدەدرێنە نێویەوە ﴿سألهم خزنتها﴾ پاسەوانەکانی لێیان دەپرسن.

چاودێریی و سەرپەرشتی فریشتەکان بۆدۆزەخ لەچەند ئایەتێکدا ڕونکراوەتەوە, بۆ نموونە: (عليها ملائكة غلاظ شداد لايعصون الله ما أمرهم و يفعلون ما يؤمرون) (٦/٦٦). ژمارەی ئەو فریشتانەیش بەئایەتی: (عليها تسعة عشر) (٣٠/٧٤) یان بەئایەتی: (وما جعلنا أصحاب النار إلا ملائكة وما جعلنا عدتهم إلا فتنة للذين كفروا)(٣١/٧٤) دیاریکراوە. ﴿الم يأتكم نذير﴾ ئایا هیچ کە سێکی ترسێنەرتان لەلایەن خواوە بۆ نەهات، تا لەم ڕۆژە هۆشیارتان بکاتەوەو دووچاری نەبووبان..؟ ﴿٩ قالوا بلى قد جاءنا نذير﴾ بە دڵێکی زۆرتەنگەوە دەڵێن: بەڵێ بەراستی ترسێنەر (پێغەمبەر)مان بۆهات و ئامۆژگاری کردین، وەك ئەفەرموێ: (وما كنا معذبين حتى نبعث رسولا) (١٥/١٧). ﴿فكذبنا﴾ بەڵام ئێمە بروامان پێینەکردو بەدرۆزنمان زانی و باوەڕمان پێنەکرد ﴿وقلنا ما نزل الله من شىء﴾ گوتمان: خوا هیچ شتێکی بۆهیچ کەسێك دانەبەزاندووە لە وەحی ﴿إن انتم إلا فى ضلال كبير﴾ وەئێوە لەگومڕاییەکی گەورەدان! ﴿١٠ وقالوا لو كنا نسمع أو نعقل﴾ وەبەحەسرەتەوە دەڵێن: وە ئەگەر ئێمە بیستبامان، یان تێگەیشتباین و ئەقڵمان خستباکار لە دونیادا ﴿ماكنا فى أصحاب السعير﴾ ئەوڕۆ لە قیامەتا نەدەبووینە هاوڕێی دۆزەخ، بەڵام بەداخەوە لەچاوو گوێ ودڵ سوودمان وەرنەگرت، ئەوا ئەمڕۆش ئەوقەی دۆزەخبووین، وەك ئەفەرموێ: ﴿١١ فاعترفوا بذنبهم﴾ جابە خەجاڵەتیەوە ددانیان بەگوناح و تاوانی خۆیاندا نا ﴿فسحقا لأصحاب السعير﴾ دەسا دووری لەرەحمەتی خوا بۆ دۆزەخییەکان، شیاوی باسە لە جێگایەکی تردا ئەفەرموێ: (ختم الله على قلو بهم وعلى سمعهم)(٧/٢) یان دەفەرموێ: (إنا جعلنا على قلو بهم اكنة أن يفقهوه وفى آذانهم وقرا)، (٥٧/١٨).یان دەفەرموێ: (إنا خلقنا الإنسان من نطفة أمشاج نبتليه فجعلناه سميعا بصيرا) (٢/٧٦) یان دەفەرموێ: (قل هو الذى انشاكم وجعل لكم السمع والأبصار والأفئدة قليلا ما تشكرون) (٢٣/٦٧) یان (ولا تكو نوا كالذين قالوا سمعنا وهم لايسمعون) (١٢/٨)یان (قالوا قد سمعنا لو نشاء لقلنا مثل هذا)(٣١/٨) یان (وقال الذين كفروا لاتسمعوا لهذا القران والغوا فيه..)، (٢٦/٤١) یان دەفەرموێ: (ويل لكل أفاك أثيم يسمع آيات الله تتلى عليه ثم يصر مستكبرا كأن لم يسمعها فبشره بعذاب اليم. وإذا علم من آياتنا شيئا اتخذها هزوا)(٤٥/٧-٩) یان دەفەرموێ: (وإذا تتلى عليه آياتنا ولى مستكبرا كأن لم يسمعها كأن فى أذنيه وقرا)(٣١/٧).

## ترسان لەخوا بە نەهێنیی وپەنهانیی:

ئنجا باسی پاداشتی فراوانی باوەڕداران دەکاوئەفەرموێ: ﴿[١٢] إن الذين يخشون ربهم بالغيب﴾ بەراستی ئەو کەسانەی کە بەنهێنی وپەنهانیی لە پەروەردگاریان ئەترسن, چونکە دەزانن کە پەنهان و نادیارلای ئەو یەکسانە ﴿لهم مغفرة واجر كبير﴾ لیخۆشبوون و پاداشێکی گەورەیان بۆ هەیە، ئەم چەند ئایەتەش گرنگی ترسان لەخوا نیشان دەدەن, وەکو دەفەرموێ: (الذين يخشون ربهم بالغيب وهم من الساعة مشفقون)(٤٩/٢١).یان دەفەرموێ: (إنما يخشى الله من عباده العلماء) (٢٨/٣٥).یان دەفەرموێ: (وإن من الحجارة لما يتفجر منه الأنهار وإن منها لما يشقق فيخرج منه الماء وإن منها لما يهبط من خشية الله...) (٧٤/٢).یان دەفەرموێ: (لوانزلنا هذا القرآن على جبل لرأيته خاشعا متصدعا من خشية الله..)(٢١/٥٩).یان دەفەرموێ: (من خشى الرحمن بالغيب وجاء بقلب منيب)(٥٠/٣٢-٣٣).یان (فالله أحق أن تخشوه إن كنتم مؤمنين) (١٣/٩).وەدەفەرموێ: (الذين يبلغون رسالات الله ويخشونه ولا يخشون أحدا إلا الله وكفى بالله حسيبا) (٣٩/٣٣).وەدەفەرموێ: (الذين يؤمنون بالغيب)(٢/٢). ﴿[١٣] واسروا قولكم اواجهروا به﴾ چ بەسرتە سرت قسەبکەن، یان بەئاشکرا،لای خوا یەکسان و چونیەکە، ئەو هیچ شتێکی لا گوم نابێ ﴿إنه عليم بذات الصدور﴾ بەڕاستی ئەو بەهەموو نهێنی نێو دڵ و سینەکان زانایە ﴿[١٤] الا يعلم من خلق﴾ مەگەر خوا نازانێ کێی دروستکردووەو چۆنی دروستکردووە ﴿وهو اللطيف الخبير﴾ لەکاتێکدا زۆر وردبین و بە ئاگایە؟ کەوابوو لەخوا بترسن، پیلان بۆ موسڵمانان مەگێڕن نەبەنهێنی، نە بەئاشکرا.

## زەویی بۆ ئێوە کەویی و رامکراوە:

بۆ جارێکیتر دێتەوە سەر باسی هەندێ لە بەهرەکانی خوا کە بە خەڵکانی بەخشیون, بۆیە ئەفەرمووێ: ﴿[١٥] هو الذى جعل لكم الأرض ذلولا﴾ ئەو خوایەیە کە زەویی رامکردووەوبۆتان ,بەهەر شێوەیەك بتانەوێ سوودی لێ وەربگرن ئامادەیە، وە لەگەڵ ئەو هەموو جم و جووڵە و سوڕانەوەیدا، ئێوە زۆر بە ئاسوودەیی ژیانی خۆتانی تیا ئەبەنەسەر.

زانایانی (جیۆلۆجیا) ئەڵێن: زەوی لەماوەی (٢٤) کاتژمێردا، (٢٤)هەزار میل ئەخولێتەوە، وە لە تەنها کاتژمێرێکا (٦٥) هەزار میل ئەڕوا تا بەگردیی ڕۆژدا بسوڕێتەوە.. جا لەگەڵ ئەو هەموو بزووتن و جموجووڵەیدا هێشتا زۆر بەئاسانی خەڵك بەسەر پشتیەوە ئەحەسێنەوە و ئەژین ﴿فامشوا فى مناكبها﴾ جا کەوابوو بچن بەهەموو گۆشەو کەنارێکیا هەوڵی ژیانی خۆتان بدەن و بازرگانی بکەنە پیشە ﴿وكلوا من رزقه﴾ وله ڕزق و ڕۆزیی بخۆن.

الجزء التاسع والعشرون | سورة الملك

وَأَسِرُّوا قَوْلَكُمْ أَوِ اجْهَرُوا بِهِ إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ (١٣) أَلَا
يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ (١٤) هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ
الْأَرْضَ ذَلُولًا فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِن رِّزْقِهِ وَإِلَيْهِ النُّشُورُ
(١٥) ءَأَمِنتُم مَّن فِي السَّمَاءِ أَن يَخْسِفَ بِكُمُ الْأَرْضَ فَإِذَا هِيَ
تَمُورُ (١٦) أَمْ أَمِنتُم مَّن فِي السَّمَاءِ أَن يُرْسِلَ عَلَيْكُمْ حَاصِبًا
فَسَتَعْلَمُونَ كَيْفَ نَذِيرِ (١٧) وَلَقَدْ كَذَّبَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَكَيْفَ
كَانَ نَكِيرِ (١٨) أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَى الطَّيْرِ فَوْقَهُمْ صَافَّاتٍ وَيَقْبِضْنَ مَا
يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا الرَّحْمَٰنُ إِنَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ بَصِيرٌ (١٩) أَمَّنْ هَٰذَا الَّذِي
هُوَ جُندٌ لَّكُمْ يَنصُرُكُم مِّن دُونِ الرَّحْمَٰنِ إِنِ الْكَافِرُونَ إِلَّا فِي غُرُورٍ
(٢٠) أَمَّنْ هَٰذَا الَّذِي يَرْزُقُكُمْ إِنْ أَمْسَكَ رِزْقَهُ بَل لَّجُّوا فِي عُتُوٍّ
وَنُفُورٍ (٢١) أَفَمَن يَمْشِي مُكِبًّا عَلَىٰ وَجْهِهِ أَهْدَىٰ أَمَّن يَمْشِي سَوِيًّا
عَلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ (٢٢) قُلْ هُوَ الَّذِي أَنشَأَكُمْ وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ
وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ (٢٣) قُلْ هُوَ الَّذِي ذَرَأَكُمْ
فِي الْأَرْضِ وَإِلَيْهِ تُحْشَرُونَ (٢٤) وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا الْوَعْدُ إِن كُنتُمْ
صَادِقِينَ (٢٥) قُلْ إِنَّمَا الْعِلْمُ عِندَ اللَّهِ وَإِنَّمَا أَنَا نَذِيرٌ مُّبِينٌ (٢٦)

٥٦٣

بەڵێ پێویستە مەردم هەوڵی ژیان بداو، چاوەڕوان نەبێت تا خوا بۆی ببارێنیّ! وەك پێشەوا (عومەر) خوا لێی ڕازی بێت -کاتێ خەڵکێکی بێ ئیش وکاری دیتبا دەیوت: ئێوە کێن و چین ئاوا بێ کردو کۆششن؟ دەیانوت: ئێمە قەوم و گەلێکین پشتمان بەخوا بەستووە، بۆیە ئیش وکارناکەین!، ئەویش پێیدەوتن: نەخێر، ئێوە گەلێکی بێکارو تەمەڵن، دەبێ تۆو بچێننە زەویی، ئەوجاپشت بەخوا ببەستن.﴿وإليه النشور﴾ و هەر بۆلای خوایە زیندو بوونەوە بۆ حیساب وجەزا.

**ئەی لەو خوایە ناترسن لە ئاسمانە؟:**

جا پاش ئەوەی کەحالەتی هێوریی وهێمنی و ڕامکردنی زەویی بۆ ژیانیان باسکرد، ئێستاش دایان ئەچڵەکێنیّ وپێیان ئەڵێ: ئایا ناترسن کەخوا ئەوخۆشی وئاسوودەیەتان لێ تێك بدات..؟ زەویی دەست بکات بە جموجوڵ؟ ﴿[16] ءامنتم من فى السماء ان يخسف بكم الأرض﴾ ئایا دڵنیان لەو (خوایە)ی کە لە سەرووەوەیە ئەی بتپەرستان! بەناخی زەوییدا بتانباتە خوارەوە و قووتتان بدات، وەك (قاروون)ی قووتکرد؟ ﴿فإذا هى تمور﴾ ئینجا ئەو حەلە بەهەمیشە زەویی بێت و بچیّ و بجولێت، کەوابوو هەرگیز لەدەسەڵاتی خوای بەبەزەیی دڵنیا مەبن، چونکە هەرکاتێ قاری لێگرتن دەیگریّ ﴿[17] ام امنتم من فى السماء ان يرسل عليكم حاصبا﴾ یان لەو زاتەی لە سەرەوەیە دڵنیان، کە وردە زیختان بەسەردا ببارێنیّ..؟ ئیمامی موفەسیرین (ئیبن جەریری طەبەری) لەمانای (..من فى السماء...) دا دەڵێت: مەبەست بەو (زاتە) لەئاسمانە هەرزاتی خوا خۆیەتی، وەك ئەهلی سووننەت وجەماعەت بە تێکڕا ئەو بڕیارەیان داوە! بۆ ئەو ڕاستیەش ئەو فەرموودەیە دەکەنە بەڵگە کە پێغەمبەر ﷺ لەکەنیزەیەکی پرسیّ: (أين الله)؟ واتە: خوا لەکوێیە؟. (قالت فى السماء)، ئەویش گوتی: لە سەرووەوەیە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((أعتقها فإنها مؤمنة)). دەسائازادی بکەن، چونکە خاوەن ئیمان و باوەڕە. ئەم فەرموودەیش بەشێکە لەو فەرموودەیە کە پێشەوا (موسلیم) لە(صەحیح)ـەکەیدا هێناویەتی وبەکورتیی دەڵێت: (...وكانت لى جارية ترعى غنما لى قبل أحد والجوانية، فاطلعت ذات يوم فإذا الذئب قد ذهب بشاة من غنمها، وأنا رجل من بنى آدم آسف كما يأسفون لكنى صككتها صكة، فأتيت رسول الله ﷺ فعظم ذلك على، قلت: يارسول الله أفلا أعتقها؟ قال: (إئتنى بها)، فأتيته بها فقال لها: أين الله..؟ قالت: فى السماء قال: من أنا؟ قالت: أنت رسول الله. قال: ((أعتقها فإنها مؤمنة)) موسلیم:٢١/١٦/فى المساجد ومواضع الصلاة، باب تحريم الكلام فى الصلاة). وە هەروەها تەفسیری (تيسير الكريم الرحمن)ی شێخ سەعدی (١٣٠٧)و (١٣٧٦) لەتەفسیری (أم أمنتم من فى السماء..)دا دەڵێت: (وهو الله تعالى، العالى على خلقه)، وە زانایانی (سەلەف)یش دەڵێن: بیژەی (فى) لە (فى السماء)دا بەمانای (على السماء)یە، هەروەك لە(ولأصلبنكم فى جذوع النخل -أى على جذوع النخل) بەمانای (على)یە، ئەمە ڕای زانایانە بۆ تەفسیری (من فى السماء)، ئیتر ئەوانەی کە دەڵێن: مەبەست بە (من فى السماء) (جوبریل)ە، یان دەڵێن لەسەر ڕاو بۆچوونی عەرەبەکان هاتووە کە پێیان وابوو: خوا لەئاسماندایە! ئینجا خواش لەسەر بیروبۆچوونی خۆیان قسەیان لەگەڵ دەکات.. دیارە ئەم هەموو بۆچوونەی دواییە لەگەڵ ڕوحی قورئانەکەدا دورن و دەست نادەن، چونکە ئەوەی بتوانیّ خەڵك نقووم بکاو لە ئاسمان بێت،یان زیخ ببارێنیّ هەرخوایە. وەك لەئایەتەکاندا هاتووە ﴿فستعلمون كيف نذير﴾ ئەوجا ئەزانن تۆڵەی من چۆنە ﴿[18] ولقد كذب الذين من قبلهم﴾ وبەهەقیقەت پێش ئەو بت پەرستانە خەڵکانی تریش پەیامبەرانیان بەدرۆزن دانا وەك گەلی (نووح و، عادو، سەمود..).. هتد ﴿فكيف كان نكير﴾ جا چۆن بوو نکووڵی من بۆیان؟ ئایا ئەزانن چۆن قارم لێگرتن.؟ جا ئێوەش هۆشیار بن.

بەڵێ هەرچی لەم بوونەوەرەدا روودات وەکو: زەمین لەرزە، ڕۆچوون، بەردەباران، بای وێرانکەر، گەردەلوول و هەرچی تر، هەمووی بەدەستی پاشای ئەم جیهانەیە، وە ئەوان هەرچەندەکۆشك وتەلار بڕازێننەوەو خۆیان قایم بکەن..! هەرگیز لەدەستی خوا رزگاریان نابێ.

**فڕین و لەنگەر گرتنی مەلـەکان بە حەواوە بەدەسەڵاتی خوایە :**

ئینجا بۆ ئەوەی وەبیریان بێنێتەوەو لەئاسەواری دەسەڵاتی خوا ورد ببنەوە دەفەرموێ: ﴿[19] اولم يروا إلى الطير فوقهم صافات ويقبضن﴾ ئایا سەیری باڵندەیان نەکردووە بەڕاسەریانەوە بە باڵکراوەیی لەکاتی پەروازیانـدا وباڵەکانیان دەهێننە وە یەك؟ ﴿ما يمسكهن إلا الرحمن﴾ ئەو باڵندانە تەنها خوای بەخشندەی دلۆوان رایگرتوون , بێگومان لەمەدا نیشانەو بەڵگە هەیە, دەسا بۆ بڕوا ناهێنن؟! وەك لە جێگایەکی تردا هەر لەو بارەوە دەفەرموێ: (ألم يروا إلى الطير مسخرات في جو السماء مايمسكهن إلا الله إن في ذلك لآيات لقوم يؤمنون)(٧٩/١٦). ئەمانە هەموو جەخت لەسەر ئەو ماناو مەبەستە دەکەنەوە. ﴿إنه بكل شئ بصير﴾ بەڕاستی ئەو خوایە بەهەموو شتێك بینایە ,چاوی لە هەموو بونەوەرەو دەزانێ هەر شتەی چۆن ژیانی ئەڕواو، چۆن بۆی باشە, بەو جۆرە هۆی ژیانی پێ بەخشیوە.

ئینجا سەر زەنشتی هاوبەش پەیداکەران ئەکاو ئەفەرموێ: ﴿[20] امن هذا الذى هو جند لكم ينصركم من دون الرحمن﴾ ئایا ئەو کەسە کێیە کە خۆی بە لەشکرو سوپای ئێوە دەزانێت و وانیشان دەدات کە بەبێ خوای رەحمان دەتوانێت یارمەتیتان بدات؟ واتە: ئەگەر ئیرادەی زیانێکی بە ئێوە ببێ ﴿إن الكافرون إلا فى غرور﴾ بێ باوەڕان هەمیشە سەر لێشێواوو فریوو خواردوون, واتە: ئەگەر پێیان وابێت بتەکانیان بەهاواریانەوە دێن، دەبا بیری بکەنەوەو وازیان لێ بێنن. ﴿[21] امن هذا الذى يرزقكم إن امسك رزقه﴾ یان کێیە ئەوەی رۆزیتان دەدا ئەگەر خوا رزقی گرتەوە لێتان ﴿بل لجوا فى عتو ونفور﴾ بەڵکو ئەوان رۆچوون لە گومرایی و دوورە پەرێزی لە هەقدا.

**نەزیلەی موسڵمان و کافر :**

ئینجا خوا نموونەیەك بۆ مرۆڤیباوەڕدارو بێ باوەڕ دێنێتەوەو دەفەرموێ: ﴿[22] افمن يمشى مكبا على وجهه اهدى﴾ ئایا ئەو کەسەی کە دەمەوڕوو کەوتووەو، بەو حاڵەتەوە بەرێدا دەچێ, رێدەرکردووترە ﴿امن يمشى سويا على صراط مستقيم﴾ یان ئەو کەسەی کە بە قنجی وقیتی لە سەر رێگەیەکی راستەوە دەڕوا؟ دیارە یەکەمەکەیان نموونەی مرۆڤی بێ بڕوایە, چونکە وەکو کوێرو نابینا مل ئەنێ ورێی راست هەڵە دەکات , دووەمیشیان نموونەی مرۆڤی موسڵمانە کە زۆر بەشارەزایی و بەئاگاییەوە پێهەڵ دەگرێ و دەڕوا.

**ئەوی وەدیهێناون، زیندووشتان دەکاتەوە:**

﴿[23] قل هو الذى انشأكم وجعل لكم السمع والأبصار والأفئدة﴾ ئەی پێغەمبەر! ﷺ پێیان بڵێ: هەرئەو خوایەیە ئێوەی بەدیهێناوە و دروستیکردوون و گوێ و چاوو دڵیی پێبەخشیون وهەتا بەچاو رێگای راست دەرك بکەن، بەگوێ ببیستن و، بەدڵ بیری لێ بکەنەوە ئینجا باوەڕ بێنن ﴿قليلا ماتشكرون﴾ کەچی ئێوە کەمێ شوکرانە بژێریی دەکەن..! ﴿[24] قل هو الذى ذراكم فى الأرض﴾ پێیان بڵێ: کەهەر ئەو زاتەیە ئێوەی لە زەویی بڵاوکردۆتەوە ﴿واليه تحشرون﴾ و تەنهابۆلای ئەویش کۆ ئەکرێنەوە بۆ لێکۆڵینەوەو پاداش تۆڵە ﴿[25] ويقولون متى هذا الوعد إن كنتم صادقين﴾ بەگاڵتەشەوە دەڵێن: ئەم بەڵێنە بەهاتنی ئەو سزایە کەیە، ئەگەر ئێوە ڕاست ئەکەن..؟! ﴿[26] قل إنما العلم عند الله﴾ پێیان بڵێ: بێگومان زانیاریی تەواو – بۆ هاتنەکەی– تەنها لای خوایە ,منیش وەك ئێوە بەندەم وشتێك

نازانم ﴿وإنما انا نذير مبين﴾ و من تەنها بێدار کەرەوەو ترسێنەرێکی ئاشکرام، واتە:کاری من هەر ئەوەندەیە ﴿٢٧
فلما راوه زلفة﴾ ئینجا کاتێ ئەو بەڵێنی خوایە بە سزای ڕۆژی قیامەت لەنزیکەوە دیتیان ﴿سيئت وجوه الذين
كفروا﴾ روخساری ئەوانە باوەڕیان نەبوو تاڵ و ترش و ناشیرین دەبێت ﴿وقيل هذا الذى كنتم به تدعون﴾ و پێیان
ئەوترێ: ئا ئەمە ئەو (ڕۆژەیە) کە ئێوە داواتان دەکرد و بەدرۆتان دەزانی.

**موسڵمانانیش تیا بچن کێ خوانەناس لە ئێش و ئازار دەپارێزێ؟:**

بێباوەڕەکان گەلێ جار ئاواتی مردنی پەیامبەرو موسڵمانەکانیان ئەخواست..! بۆیە خوا فەرمووی: ﴿٢٨ قل
ارايتم إن اهلكنى الله ومن معى او رحمنا﴾ پێیان بڵێ: هەواڵم بدەنێ ئەگەر خوا من و هەموو ئەوانەی لەگەڵ مندان
لەناو بەرێ، یان روحم و میهرەبانیمان لەگەڵ بکات؟ ﴿فمن
يجير الكافرين من عذاب اليم﴾ کێهەیە بێ باوەڕان لەسزای
بەئێش و سەخت پەنابدا؟ ﴿٢٩ قل هو الرحمن آمنا به﴾
بڵێ:ئەو خوا بە بەزەیییە باوەڕمان پێکردووە ﴿وعليه
توكلنا﴾ و هەر بەویش پشتمان بەستووە ﴿فستعلمون من
هو فى ضلال مبين﴾ئەوسا ئەزانن کێ لەلاریی و گومڕاییەکی
ئاشکرادایە..؟ من یان ئێوە؟ ﴿٣٠ قل ارايتم إن اصبح ماؤكم
غورا﴾ بڵێ: هەواڵم بدەنێ ئەگەر ئاوەکەتان ڕۆچێ بەناخی
زەویدا و هەڵیمژێ ﴿فمن يأتيكم بماء معين﴾ کێ ئەتوانێ
ئاوێکی روون و زوڵاڵتان بۆ بەدەست بێنێت؟ دیارە جگە
لەوە کەدەبێ هەر بڵێن مەگەرخوا دەروومان لێ بکاتەوە،
وەڵامێکی تر نیە، جاکەوابوو چارتان هەر ئەوەیە کە ئەمڕۆ
پێش هاتنی ئەوڕۆژەیە باوەڕ بێنن و ملکەچ بن بۆدەسەڵاتی
بێ سنووری خوای میهرەبان.

زۆر سوپاس بۆ خوای خاوەن بەزەیی کە یارمەتیدام بۆ
تەواو کردنی تەفسیری سوورەتی (مولك).

*** *** ***

الجزء التاسع والعشرون — سورة القلم

فَلَمَّا رَأَوْهُ زُلْفَةً سِيٓـَٔتْ وُجُوهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَقِيلَ هَٰذَا ٱلَّذِى
كُنتُم بِهِۦ تَدَّعُونَ ﴿٢٧﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَهْلَكَنِىَ ٱللَّهُ وَمَن مَّعِىَ
أَوْ رَحِمَنَا فَمَن يُجِيرُ ٱلْكَٰفِرِينَ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢٨﴾ قُلْ هُوَ
ٱلرَّحْمَٰنُ ءَامَنَّا بِهِۦ وَعَلَيْهِ تَوَكَّلْنَا فَسَتَعْلَمُونَ مَنْ هُوَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ
﴿٢٩﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَصْبَحَ مَآؤُكُمْ غَوْرًا فَمَن يَأْتِيكُم بِمَآءٍ مَّعِينٍ ﴿٣٠﴾

سُورَةُ ٱلْقَلَمِ — ترتيبها ٦٨ — آياتها ٥٢

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

نٓ ۚ وَٱلْقَلَمِ وَمَا يَسْطُرُونَ ﴿١﴾ مَآ أَنتَ بِنِعْمَةِ رَبِّكَ بِمَجْنُونٍ ﴿٢﴾
وَإِنَّ لَكَ لَأَجْرًا غَيْرَ مَمْنُونٍ ﴿٣﴾ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾
فَسَتُبْصِرُ وَيُبْصِرُونَ ﴿٥﴾ بِأَييِّكُمُ ٱلْمَفْتُونُ ﴿٦﴾ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ
أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ ﴿٧﴾ فَلَا تُطِعِ
ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿٨﴾ وَدُّوا۟ لَوْ تُدْهِنُ فَيُدْهِنُونَ ﴿٩﴾ وَلَا تُطِعْ كُلَّ
حَلَّافٍ مَّهِينٍ ﴿١٠﴾ هَمَّازٍ مَّشَّآءٍۭ بِنَمِيمٍ ﴿١١﴾ مَّنَّاعٍ لِّلْخَيْرِ مُعْتَدٍ
أَثِيمٍ ﴿١٢﴾ عُتُلٍّۭ بَعْدَ ذَٰلِكَ زَنِيمٍ ﴿١٣﴾ أَن كَانَ ذَا مَالٍ وَبَنِينَ
﴿١٤﴾ إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَٰتُنَا قَالَ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٥﴾

٥٦٤

## ٦٨- سوورەتی ( قەڵەم )ـە

## مەککەییەو ( ٥٢ ) ئایەتە

**بەناوی خوای بە بەزەیی میهرەبان**

ئەم سوورەتە لەپاش سوورەتی (عەلەق)ـەوە دابەزیوە، ئەمیش وەك سوورەتە مەککەییەکانی تر گرنگی دەدات
بە: یەکخواپەرستیی، پەیامی پەیامبەرێتی پێغەمبەر، زیندووبوونەوە بۆ پاداش و تۆڵە. جا پێش هەمووشتێك
سوێند ئەخوات کە پێغەمبەر ﷺ خاوەن ڕەوشتێکی بەرزە و، دوورە لەو درۆو پڕوپاڵانتەیە کەبێ بڕوایان ئەیدەنە
پاڵی.. ئینجا هەڵوێستی کافرەکانی ئەو سەردەمە بەرامبەر بە بانگەوازەکەی پەیامبەر ﷺ لەگەڵ باسکردنی ئەو
سزاو تۆڵەیە ئامادە کراوە بۆیان لای خوای گەورە. نموونەی بێ بڕواکان دێنێتەوە کاتێ پەیامبەر نێررایە لایان و

پشتگوێیان خست و ململانێیان لەگەڵ کرد، بەخاوەنانی باخەکە، کە خوای کارجوان پیت و بەرەکەتێکی ئێجگار فراوانی تێخستبوو، جا لەجیاتی ئەوە کە ئەوان بەشی هەژارانی لێ بدەن، کەچی بێ بەشیان دەکردن و، بە دزییەوە بەرەکەیان لێ ئەکردەوە..!! ئینجا خوای گەورەیش ڕقی لێ هەڵگرتن و ئافەتی خستە باخەکەوەو بووبە قەرەبوو. وەهەروەها کۆتایی بەمەزەنەکردنی نێوان بڕواداران و بێ بڕوایان دێ، پاشان دان نان بەوەدا کەئەودوانە وەك یەك نابن: (افنجعل المسلمین کالمجرمین..؟) هەر بەم پێیەش بەرەو دەرگا داخستن ئەڕوات، بەڵام بەپەلە پێش تەواو بوونی حاڵەتێکی قورسی ناهەمواری ڕۆژی دوایی پێشکەش دەکات و، بەکلیلی ئارام وسەبر دەرگا لەخۆ دائەخا.. (فاصبر لحکم ربك..).

**سوێند بە بنووس و بەوەش دەینوسێ، تۆ لێوە نیت و ئاکار بەرزی:**

﴿بسم الله الرحمن الرحیم* [١] ن﴾ ئەم پیتی (ن)ـە پیتێکە لە (٢٨) پیتە عەرەبییەکان، شیاوی باسە (٢٩) سوورەتی قورئان بەم پیتە بچڕاوانە دەست پێ دەکەن، هەرچەندە هەموویان ڕەوانبێژیی و، خۆشخوانیی و، بێ وێنەیی قورئان رادگەیەنن.. بەڵام لەڕاستییدا مانا ڕاست و تەواوەکەیان مەگەر تەنها خوا بیزانێ ﴿والقلم وما یسطرون﴾ سوێند بە (قەڵەم) و، بە هەر شتێکی ڕاست و دروست کە پێی ئەنووسن ,لەبەرزیی و پایەی پەیامبەرو قورئان و.. هتد ﴿[٢] ما انت بنعمة ربك بمجنون﴾ سوێند بە قەڵەم و دێڕەکان: تۆ لە چاکەی پەروەردگارتەوە شێت ولێوە نیت, وەك ئەو نەفامانە ئەڵێن ﴿[٣] وإن لك لأجرا غیر ممنون﴾ وە بەڕاستی پادلشێکی نەبڕاوە بۆتۆهەیە، چونکە بێ بڕوایان و هاوبەش پەیداکەران زۆر ئازارت دەدەن و دڵت ئێشێنن، تۆیش خوا هەڵناگرێ چاکبە خۆتا ددان ئەگری، بۆیە هەر لە قورئاندا دەفەرموێ: (عطاء غیر مجذوذ)(١٠٨/١١). ﴿[٤] وإنك لعلی خلق عظیم﴾ وەبەڕاستیی تۆ لە سەرووخوو و ڕەوشتێکی ئێجگار پەسەندو گەورەیت: زانست و زانیاریی، هێمنیی و ئارامیی، شەرم وشکۆ، بەخشش و دەستگرۆیی، شوکرانە بژێریی و، سوپاسگوزاریی، کەم نەفس و دەسنەگرتنەوە لە دونیا،دلۆڤانیی و میهرەبانیی، ڕەفتاری شیرین و ئەدەب و وێڵ و..هتد هەر بۆ بەرزیی وشکۆمەندیی ئەویشە کە(ئەنەس) ﵁ دەڵێت: (کان رسول الله ﷺ أحسن الناس خلقا)متفق علیه. یان (عبدالله ی کوڕی کوڕی عەمری کوڕی عاص –رضی الله عنهما– دەڵێت: ((لم یکن رسول الله فاحشا ولا متفاحشا وکان یقول: إن من خیارکم أحسنکم أخلاقا)) متفق علیه. مەبەست ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ ڕەوشت بەرزو، ئاکارچاك و، زمان شیرین و، ڕوو خۆشبووە، یان بەکورتتر بڵێین: قورئان ببینەو، ئەویش ببینە.﴿[٥] فستبصر ویبصرون﴾ جال ە ئایندەدا تۆ ئەبینی و، ئەوانیش (بێ باوەڕەکان) ئەبینن ﴿[٦] بأیکم المفتون﴾ و کێتانەوەیە شێتی ﴿[٧] إن ربك هو أعلم بمن ضل عن سبیله﴾ بەڕاستی پەروەردگارت لەهەموو کەسێك زاناترە کێ لەڕێبازی ئەولایداوە ﴿وهو اعلم بالمهتدین﴾ وەئەویش لە هەموو کەس زاناترە بەوانەی ڕێنمان و ڕێگەی ئەویان گرتووە، ئیتر پێویست بەقسەی زیادە ناکات، وەبەم نزیکانەیش دەر ئەکەوێ.

**پێشنیازی کافران وەرمەگرە:**

﴿[٨] فلا تطع المکذبین﴾ جا کەوابوو تۆ بەقسەی ئەوانە مەکە بەدرۆزنت دەزانن ﴿[٩] ودوا لو تدهن فیدهنون﴾ ئاواتە خوازن کە تۆ نەرمی بکەیت (لە ئایەنەکەتدا) دەربارەی بیرو باوەڕەکەت , جا ئەوانیش –ئەوحەلە– نەرمیت لەگەڵ بکەن و ڕێککەون، واتە: ئەگەر هەر تۆزقاڵێك لێیان نزیك ببیتەوەو دەست لەبەرنامەکەت شل بکەیت، ئەوانیش ئامادەن گوێڕایەڵ بن! ﴿[١٠] ولا تطع کل حلاف مهین﴾ و گوێڕایەڵی لە هیچ سوێند خۆرێکی درۆزن و بێ بار مەکە ﴿[١١] هماز مشاء بنمیم﴾ زۆر پلارگری بشێون وتێکدەر بە قسە هێنان وقسە بردن (لەنێوان مەردومدا)

پێغەمبەریش ﷺ ئەفەرموێ: ((لا یدخل الجنة قتات)) ئەحمەد, ترمزی, نەسائی, ئەبووداود. لەڕیوایەتێکی تردا ((لا یدخل الجنة نمام)).پێشەوا ئەحمەد. واتە: قسە هێن و، قسە بەر ناچێتە بەهەشت.﴿[١٢] مناع للخیر﴾ ڕژدو چرووك بۆ بەختکردنی ماڵ و سامان لە ڕێی خوا ﴿معتد اثیم﴾ دەست درێژکاری گوناهبار، هەرچی بێتە بەر دەستی سڵی لێ ناکاتەوە ﴿[١٣] عتل بعد ذلك زنیم﴾ بەدخوو, لە دوای ئەوەش پیس و نارەسەن و باوك نادیار. لە فەرموودەدا هاتووە: ((ألا انبئکم بأهل النار؟ کل عتل جواظ مستکبر)). متفق علیه. خاوەنی (فی‌ظلال القرآن) دەڵێت: (زنیم) بەکەسێك دەوترێت کە نەژادی گومان لێکراوبێت، وە یامرۆیەکی پیس وخراپکارو، شەڕ فرۆش و گێرەشێوێن بێت. جا پێ دەچێ بۆ پیاوێکی وەك (وەلید) ئەم مانای دوایی‌یە: (دڵرەق و کەللە ڕەق و شەڕ فرۆش) دەس بدا، خوا خۆیشی چاکتر ئەزانێ.

**ڕاڤەکەرانی قورئان دەڵێن:** ئەمە ببێ و نەبێ تەنها (وەلیدی کوڕی موغیرە)یە، چونکە باوکی ئەو نادیار بوو، وە لەپاش هەژدە ساڵ لەتەمەنی موغیرە، ئەوجا (وەلید) کردوویەتی بەکوڕی خۆی. واتە تۆ ئەی پێغەمبەر! ﷺ هەرگیز بەگوێی نامەردێکی ئاوا نەکەیت ﴿[١٤] ان کان ذامال وبنین﴾ لە بەرئەوەی کە داراو کوڕدار بوو ﴿[١٥] إذا تتلی علیه آیاتنا﴾ کاتێ کە ئایەتەکانی ئێمەی بەسەرا بخوێنرێنەوە ﴿قال اساطیر الأولین﴾ بێباکانە ئەڵێ: ئەمە ئەفسانەو قسەی باتڵ و پوچی پێشینانە.!! لەباتی ئەوە کە سوپاسگوزار بێت لەپاش ئەو هەموو سامان و کوڕانەوە ,کەچی ئەوەندە نەفامە بەگژ تۆدا دێ..!! ﴿[١٦] سنسمه علی الخرطوم﴾ بە تەئکید بەم نزیکانە لووتی نیشان دەکەین و پۆزەی ئەشکێنین. (خرطوم) لە بنەڕەتا بەلووتی بەرازی کەژیی و وشکانی دەڵێن، چونکە (وەلید) پیاوێکی لووت بەرزو دەعیە چیبوو، بۆیە خواش بەوشێوەیە ناوی دەباو سەرلووتی ڕەش دەکات، دیارە مەبەست ئەوەیە: کە دەبێ ڕیسوای بکەین. بەڵێ.. پاش دە دوازدە ساڵ، لە (بەدر)دا مافی خۆی وەرگرت و پۆزەی دیاریکرا، تا مرد پێوەی دیار بوو.

## نەقڵی خوانەناسان لە نەقڵی خاوەن باخەکان دەچێ:

ئینجا نمونەیەکی لاریی و سپڵەیی (مەککەیی)یەکان دێنێتەوە کاتێ کە خوای بەهەق ئەو هەموو خۆشگوزەرانییەی پێ بەخشین و پەیامبەری بۆ ناردن، کەچی لەباتی شوکرانە بژێری کوفری نیعمەتیان دەکرد! بۆیە ئەفەرموێ: ﴿[١٧] إنا بلوناهم﴾ بەڕاستی ئێمە بتپەرستەکانی مەککەمان تاقیکردنەوە بە برسێتی‌وبێبارانی ﴿کما بلونا أصحاب الجنة﴾ وەك خاوەنانی باخەکەمان ئەزموونکرد. دیارە مەککەییەکان داستانی ئەو باخەیان دەزانی، وەئەو باخەش هی پیاوێکی چاك بوو، هەموو کات لەکاتی کۆکردنەوەی بەرەکەیدا هەژارەکانی لێ ئاگادار ئەکردو ئەهاتن بەشی خۆیانیان دەبرد.. بەڵام کاتێ کەوتە دەستی وەچەکانی، دەستیان نوقاندو لێیان بڕین، وەك ئەفەرمووێ: ﴿إذ اقسموا لیصرمنها مصبحین﴾ کاتێ سوێندیان خوارد کە: لەگەڵ شەبەقدا زوو بچن بەرەکەی لێ بکەنەوە ,پێش ئەوەی هەژارەکان لەخەوهەڵسن.. ﴿[١٨] ولا یستثنون﴾ وە مافی هەژارانی لێ جیانەکەنەوە.. بەڵێ بێبەزییانە ئەم بڕیارە دڵڕەقانەیاندا. بەڵێ.. خوای باڵادەست تۆڵەی هەژارەکانی لێسەندن وەك دەفەرموێ: ﴿[١٩] فطاف علیها طائف من ربك وهم نائمون﴾ ئینجا شەوێك هێمان لەخەوا بوون , بەڵایەك (گڕەیەك) لە لایەن پەروەردگارتەوە سووڕایەوە بەسەریا﴿[٢٠] فأصبحت کالصریم﴾ ئیتر ئەوباخە سەوزو جوانە , وەك چنراوی لێهات وهیچی پێوە نەما, دەتوت شەرا لێیداوە ﴿[٢١] فتنادوا مصبحین * [٢٢] ان اغدوا علی حرثکم إن کنتم صارمین﴾ جا بەیانی بەرەو باخەکەیان ڕۆیشتن و لەناو خۆیاندا بانگیان لە یەکتر دەکر دەیانوت: بەیانی زوو بچنە سەر

باخەکەتان, ئەمر ئەیرنن ﴿٢٣ فانطلقوا وهم يتخافتون﴾ جا رۆیشتن و بە ئەسپایی لە نێو خۆیاندا تەگبیریان دەکرد ﴿[٢٤] ان لا يدخلنها اليوم عليكم مسكين﴾ کە نابێ ئەمڕۆ هیچ هەژارێك پێی بخاتە باخەکەوەو بێت بەسەرمانا ﴿[٢٥] وغدوا على حرد قادرين﴾ وەبەیانی زوو بۆی دەرچوون و ڕێگەیان گرتە بەر، وایان دەزانی ئەتوانن مەبەستیان جێبەجێ بکەن و هەژاران بێ بەش بکەن ﴿[٢٦] فلما راوها قالوا إنا لضالون﴾ ئینجا کاتێ گەیشتنە لای باخەکەو بینیان (هەڵپڕوزاوە) وتیان: بێگومان ئێمە ڕێمان ونکردووە, ئەمە باخەکەی ئێمە نییە، باخی ئێمە پڕ لەمیوە بوو ﴿[٢٧] بل نحن محرومون﴾ دوایی بیریان کردەوە وتیان نا،.. باخەکەی خۆمانە، بەڵکو ئێمە بەشبڕاوکراوین بەهۆی نییەت و نیازی خراپی خۆمانەوە ﴿[٢٨] قال اوسطهم﴾ ئەوجا ناوەنجییەکەیان - لەڕووی ڕاو بیروبۆچوونەوە - وتی: ﴿الم اقل لكم لولا تسبحون﴾ ئایاپێم نەوتن بۆچ تەسبیحات و یادی خوا ناکەن؟ واتە: دەسا تەسبیحی خوا بکەن و پەشیمان ببنەوە ﴿[٢٩] قالوا سبحان ربنا إنا كنا ظالمين﴾ ئەوانیش هەموو وتیان: پەروەردگاری ئێمە ستەمکارو ناهەقکار نیە , ئێمە خۆمان ستەمکار بووین ﴿[٣٠] فاقبل بعضهم على بعض يتلاومون﴾ ئەوسا ڕوویانکردە یەکترو لۆمەو سەر زەنشتی یەکتریان دەکرد!.. ﴿[٣١] قالوا يا ويلنا إنا كنا طاغين﴾ وتیان: تیاچوون بۆئێمە، بەڕاستیی ئێمە خۆمان یاخیی و سەرکێش و لەسنوور دەرچووبووین، بەری کێڵگەی خۆمان ئەیخوێنەوە ﴿[٣٢] عسى ربنا ان يبدلنا خيرا منها﴾ ئومێدەوارین پەروەردگارمان بەزەیی پێمان بێتەوەو چاکتر لەو باخەمان پێببەخشێت ﴿إنا إلى ربنا راغبون﴾ بەڕاستیی ئێمە بە ئومێدی ڕەزامەندی پەروەردگاری خۆمانین , هیواداریین ڕووی میهرەبانیمان تێبکاتەوە ﴿[٣٣] كذلك العذاب﴾ وەك سزای خاوەنانی باخەکەیە سزای من لەدنیادا, واتە: هەرچۆنێك سزای ناردە سەرئەو خاوەن باخانە، هەرئاوایش دەتوانێ بنێرێ بۆسەر قوورەیش، دەبا پێش ئەوەی کار لەکار بترازێ بیربکەنەوە ﴿ولعذاب الآخرة اكبر﴾ وە بەڕاستیی سزای ڕۆژی (قیامەت) گەورەترە، ﴿لوكانوا يعلمون﴾ ئەگەر ئەوان بزانن و تێبگەن, کەوابوو باهەموو پیاوخراپێك، وەبا هەموو دەوڵەمەندێك پێش, ئەوەی بەشبڕاو بکرێن، ڕاچڵەکێن..

هەندێ لە (سەلەف) دەڵێن: ئەو خاوەن باخانە نیشتەجێی وڵاتی (یەمەن) بوون. هەندێکی دیکەش دەڵێن: (حەبەشەیی) بوون.

ئینجا دێت پاشەڕۆژی موسڵمانان باس ئەکاوئەفەرموێ: ﴿[٣٤] إن للمتقين عند ربهم جنات النعيم﴾ بەڕاستی بۆ, پارێزگاران, باخاتی پڕلە نیعمەتی بەهەشت لای پەروەردگاریان ئامادەیە.

الجزء التاسع والعشرون — سُورَةُ القَلَمِ

سَنَسِمُهُۥ عَلَى ٱلۡخُرۡطُومِ (١٦) إِنَّا بَلَوۡنَٰهُمۡ كَمَا بَلَوۡنَآ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ إِذۡ أَقۡسَمُواْ لَيَصۡرِمُنَّهَا مُصۡبِحِينَ (١٧) وَلَا يَسۡتَثۡنُونَ (١٨) فَطَافَ عَلَيۡهَا طَآئِفٞ مِّن رَّبِّكَ وَهُمۡ نَآئِمُونَ (١٩) فَأَصۡبَحَتۡ كَٱلصَّرِيمِ (٢٠) فَتَنَادَوۡاْ مُصۡبِحِينَ (٢١) أَنِ ٱغۡدُواْ عَلَىٰ حَرۡثِكُمۡ إِن كُنتُمۡ صَٰرِمِينَ (٢٢) فَٱنطَلَقُواْ وَهُمۡ يَتَخَٰفَتُونَ (٢٣) أَن لَّا يَدۡخُلَنَّهَا ٱلۡيَوۡمَ عَلَيۡكُم مِّسۡكِينٞ (٢٤) وَغَدَوۡاْ عَلَىٰ حَرۡدٖ قَٰدِرِينَ (٢٥) فَلَمَّا رَأَوۡهَا قَالُوٓاْ إِنَّا لَضَآلُّونَ (٢٦) بَلۡ نَحۡنُ مَحۡرُومُونَ (٢٧) قَالَ أَوۡسَطُهُمۡ أَلَمۡ أَقُل لَّكُمۡ لَوۡلَا تُسَبِّحُونَ (٢٨) قَالُواْ سُبۡحَٰنَ رَبِّنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ (٢٩) فَأَقۡبَلَ بَعۡضُهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ يَتَلَٰوَمُونَ (٣٠) قَالُواْ يَٰوَيۡلَنَآ إِنَّا كُنَّا طَٰغِينَ (٣١) عَسَىٰ رَبُّنَآ أَن يُبۡدِلَنَا خَيۡرٗا مِّنۡهَآ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا رَٰغِبُونَ (٣٢) كَذَٰلِكَ ٱلۡعَذَابُۖ وَلَعَذَابُ ٱلۡأٓخِرَةِ أَكۡبَرُۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ (٣٣) إِنَّ لِلۡمُتَّقِينَ عِندَ رَبِّهِمۡ جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ (٣٤) أَفَنَجۡعَلُ ٱلۡمُسۡلِمِينَ كَٱلۡمُجۡرِمِينَ (٣٥) مَا لَكُمۡ كَيۡفَ تَحۡكُمُونَ (٣٦) أَمۡ لَكُمۡ كِتَٰبٞ فِيهِ تَدۡرُسُونَ (٣٧) إِنَّ لَكُمۡ فِيهِ لَمَا تَخَيَّرُونَ (٣٨) أَمۡ لَكُمۡ أَيۡمَٰنٌ عَلَيۡنَا بَٰلِغَةٌ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ إِنَّ لَكُمۡ لَمَا تَحۡكُمُونَ (٣٩) سَلۡهُمۡ أَيُّهُم بِذَٰلِكَ زَعِيمٌ (٤٠) أَمۡ لَهُمۡ شُرَكَآءُ فَلۡيَأۡتُواْ بِشُرَكَآئِهِمۡ إِن كَانُواْ صَٰدِقِينَ (٤١) يَوۡمَ يُكۡشَفُ عَن سَاقٖ وَيُدۡعَوۡنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ فَلَا يَسۡتَطِيعُونَ (٤٢)

٥٦٥

**باوەڕداران و بێ باوەڕان وەك یەك نین:**

﴿[٣٥] افنجعل المسلمین كالمجرمین﴾ ئایاموسڵمانان وەك تاوانباران لێدەكەین؟! ﴿[٣٦] مالكم كیف تحكمون﴾ چیتانە حوكم و بڕیاری وا ئەدەن..؟ چونكە هیچ كاتێك نابێ چاككارو، خراپكار چوون یەك مامەڵەیان لە گەڵ بكرێ ﴿[٣٧] أم لكم كتاب فیه تدرسون﴾ ئایا نامەیەكتان هەیە لە خواوە تێیدا دەخوێننەوە؟ ﴿[٣٨] إن لكم فیه لما تخیرون﴾ كە هەرچی ئێوە بتانەوێ بە ئارەزووی خۆتان لێیهەڵبژێرن؟! ﴿[٣٩] أم لكم ایمان علینا بالغة إلى یوم القیامة﴾ یان مەگەر پەیمانی بەهێزتان بەسەرمانەوەیە تارۆژی قیامەت دەمێنێتەوە ﴿إن لكم لما تحكمون﴾ بۆتان هەبێ هەرچی بڕیارو حوكم بدەن؟! دیارە ئەمانە هیچیان نین، نەنامەی ئاسمانیان هەیەو، نە پەیمانمان بۆ مۆركردون، كە هەرچییان ویست بیاندرێتێ.. ﴿[٤٠] سلهم أیهم بذلك زعیم﴾ لێیان بپرسە:كامیان دەسەبەری ئەو بڕیارو حوكمەیە..؟ چونكە ئێمە هیچ بەڵێنێكمان نەداونەتێ ﴿[٤١] أم لهم شركاء﴾ یاخۆ شەریك و هاوبەشیان هەن..؟ بۆ ئەوە كە موسڵمان و تاوانبار وەك یەك لێ بكەین..؟ ﴿فلیأتوا بشركائهم﴾ دە ئەگەر وایە با شەریكەكانیان بێنن بۆ هاو كارییان ﴿إن كانوا صادقین﴾، ئەگەر راست ئەكەن لە داواكەیاندا. ئاشكرایە كە هیچ كەسێك نیە بتوانێ بڕواتە ژێر ئەو داوایە.

**قولی ڕەش و سپی لە بواردا دەردەكەوێ:**

ئینجاچەند دیمەنێكی سەختی رۆژی دوایی باس ئەكاو دەفەرموێ:﴿[٤٢] یوم یكشف عن ساق﴾ رۆژی قیامەت ئەوەندە تەنگانەیە (چاك) دەكرێت بەلاداو هەموو لاقێك دەردەكەوێ, واتە: ئەوەندە رۆژێكی سەختە پێویستی بەخۆ گورجكردنەوەیە، ئیمامی (بوخاریی) لە (ئەبوو سەعیدی) خودرییەوە ئەم فەرموودەیە دێنێ: ((یكشف ربنا عن ساقه، فیسجد له كل مؤمن ومؤمنة، ویبقى من كان یسجد فی الدنیا ریاء وسمعة فیذهب لیسجد، فیعود ظهره طبقا واحدا)). فتح الباری: ٥٣١،٥٢٢/٨. مسلم: ١٦٧/١. واتە: لەو رۆژەدا پەروەردگارمان لاقی خۆی دەر دەخا، جا هەموو ژن و پیاوێكی بڕوادار سوژدەی بۆدەبا وە ئەوەی لە بەر رووپامایی وناو بانگ سوژدەی بۆ بردووە دەمێنێتەوە دەڕوا سوژدە ببا، كەچی پشتی رەق دەوەستێ و بۆی ناچەمێتەوە تاسوژدە ببا, واتە: ناتوانێ سجدە ببات, بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿ویدعون إلى السجود فلا یستطیعون﴾ وەبانگ ئەكرێن بۆ سوجدە بردن، بەڵام ناتوانن بیبەن ,چونكە دەبوو لەدونیادا سوجدە بەرن و یەكلا ببنەوە بۆخوا، كە چی ئەوان چەوتییان كردو ئێستاش پشتیان رەق بووەوناچەمێتەوە ﴿[٤٣] خاشعة أبصارهم﴾ ئەورۆژە چاویان شۆڕە ﴿ترهقهم ذلة﴾ زەبوونی وریسوایی‌دایپۆشیون و روویان نیە سەر بەرزبكەنەوە، چونكە ئەزانن چییانكردووە لە دونیادا ﴿وقد كانوا یدعون إلى السجود﴾ چونكە لەدونیادا- بانگ ئەكران بۆ سوژدە بردن ﴿وهم سالمون﴾ لەكاتێكدا لەشساغ بوون نەیان ئەبرد، ئێستا ناتوانن و دەبێ تۆڵەی خۆیان وەرگرن.

ئینجا ئا لەو بارودۆخە توندوترسناكەدا، سامناكترین هەڕەشەیان لێئەكاو دەفەرموێ:﴿[٤٤] فذرنی ومن یكذب بهذا الحدیث﴾ وازم لێبێنە بۆئەوكەسەی كە بڕوای بەم قورئانە نییە و بەدرۆی لە قەڵەم دەدات , واتە:كارو باری بدە دەستی خۆم، تۆ خۆت پێوەی سەرگەرم مەكە ﴿سنستدرجهم من حیث لا یعلمون﴾ بە تەئكید وردە بە سزا دەیان دەگرین لە لایەكەوە نازانن لەویوە سزا دێت , وەك لە جێگایەكە تردا دەفەرموێ: (أیحسبون انما نمدهم به من مال وبنین، نسارع لهم فی الخیرات بل لایشعرون). ﴿[٤٥] وأملی لهم إن كیدی متین﴾ وە لە دونیادا مۆڵەتیان دەدەم و تەمەنیان درێژیان دەكەم وپەلەیان لێناكەم بەسزا, بەڕاستی نەخشەی تۆڵەی من (لە بەرامبەر بە بێ بڕوایان) بەهێزە.. هەر گرتمن رزگار نابن، وەك خۆی ئەفەرمووێ: (وكذلك أخذ ربك إذا أخذ القرى وهی ظالمة إن أخذه ألیم

شديد). ئیمامی (بوخاریی) و ئیمامی (موسلیم) دەگێرشنەوەلە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی: ((إن الله تعالى ليملي للظالم حتى إذا أخذه لم يفلته)). پاشان ئایەتی (وكذلك أخذ ربك..)ی خوێندەوە. فتح الباري:٨/٢٠٥. مسلم: ١٩٩٧/٤. بێگومان خوا بۆماوەیەك مۆڵەتی ستەمكار دەدا- و جڵەوی بۆ شل دەكا- هەتا رۆژێ كەگرتی، ئیتر قەت لەدەستی رزگاری نابێت ﴿[٤٦] أم تسألهم أجرا فهم من مغرم مثقلون﴾ یاخۆ كرێ و مزەیەكیان لێداوا ئەكەیت لە بەرانبەر گەیاندنی پیامەكەتەوە, تا بەقورسی بزانن و نەتوانن لەژێری دەرچن؟ ﴿[٤٧] أم عندهم الغيب فهم يكتبون﴾ یان خۆئەوانە غەیبیان لایە و لە بەری دەنووسنەوە ئەوەی حوكمی پێدەكەن , تا بەئارەزووی خۆیان لێی بنووسن و چییان مەبەست بێت بۆ خۆیانی وەرگرن و.. ئیتر پێویستیان بەپیامەكەی تۆنەبێت..؟ دیارە ئەمانەهیچیان نین، كەوابوو بۆچی بەگوێت ناكەن..؟!

الجزء التاسع والعشرون — سورة القلم

خَٰشِعَةً أَبْصَٰرُهُمْ تَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ وَقَدْ كَانُوا يُدْعَوْنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ وَهُمْ سَٰلِمُونَ
﴿٤٣﴾ فَذَرْنِي وَمَن يُكَذِّبُ بِهَٰذَا ٱلْحَدِيثِ سَنَسْتَدْرِجُهُم مِّنْ حَيْثُ
لَا يَعْلَمُونَ ﴿٤٤﴾ وَأُمْلِي لَهُمْ إِنَّ كَيْدِي مَتِينٌ ﴿٤٥﴾ أَمْ تَسْـَٔلُهُمْ أَجْرًا فَهُم
مِّن مَّغْرَمٍ مُّثْقَلُونَ ﴿٤٦﴾ أَمْ عِندَهُمُ ٱلْغَيْبُ فَهُمْ يَكْتُبُونَ ﴿٤٧﴾ فَٱصْبِرْ
لِحُكْمِ رَبِّكَ وَلَا تَكُن كَصَاحِبِ ٱلْحُوتِ إِذْ نَادَىٰ وَهُوَ مَكْظُومٌ ﴿٤٨﴾ لَّوْلَا
أَن تَدَٰرَكَهُ نِعْمَةٌ مِّن رَّبِّهِ لَنُبِذَ بِٱلْعَرَاءِ وَهُوَ مَذْمُومٌ ﴿٤٩﴾ فَٱجْتَبَٰهُ رَبُّهُ
فَجَعَلَهُ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٥٠﴾ وَإِن يَكَادُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا لَيُزْلِقُونَكَ بِأَبْصَٰرِهِمْ
لَمَّا سَمِعُوا ٱلذِّكْرَ وَيَقُولُونَ إِنَّهُ لَمَجْنُونٌ ﴿٥١﴾ وَمَا هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿٥٢﴾

سُورَةُ الحَاقَّةِ — ٦٩ — آياتها ٥٢

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱلْحَآقَّةُ ﴿١﴾ مَا ٱلْحَآقَّةُ ﴿٢﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْحَآقَّةُ ﴿٣﴾ كَذَّبَتْ ثَمُودُ
وَعَادٌۢ بِٱلْقَارِعَةِ ﴿٤﴾ فَأَمَّا ثَمُودُ فَأُهْلِكُوا بِٱلطَّاغِيَةِ ﴿٥﴾ وَأَمَّا
عَادٌ فَأُهْلِكُوا بِرِيحٍ صَرْصَرٍ عَاتِيَةٍ ﴿٦﴾ سَخَّرَهَا عَلَيْهِمْ
سَبْعَ لَيَالٍ وَثَمَٰنِيَةَ أَيَّامٍ حُسُومًا فَتَرَى ٱلْقَوْمَ فِيهَا صَرْعَىٰ
كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ خَاوِيَةٍ ﴿٧﴾ فَهَلْ تَرَىٰ لَهُم مِّنۢ بَاقِيَةٍ ﴿٨﴾

٥٦٦

**خۆڕاگر بەو وەك یونس، پیش مەخۆرەوە:**

﴿[٤٨] فاصبر لحكم ربك﴾ جاتۆش ئەیپێغەمبەر! ﷺ بەئارام و خۆڕاگربە بۆ بڕیاری پەروەردگارت ﴿ولا تكن كصاحب الحوت﴾ وە وەك خاوەنی نەهەنگەكە (واتە:یونس عليه السلام) مەبە كە لە گەلەكەی تووڕە بووو، ویستی لە دەریاوە دەرچێ، وە بەویستی خوا نەهەنگەكە قوتیدا ﴿إذ نادى وهو مكظوم﴾ وەلە تەنگانەی ناوسكی نەهەنگەكەدا هاواری لە پەروەردگاری كردو لە سەر پێچی هۆزەكەی خەفەتباربوو هەردەیگوت: (لا إله إلا أنت سبحانك إني كنت من الظالمين)خوای میهرەبانیش وەلامی دایەوەو فەرمووی:(فاستجبنا له ونجيناه من الغم وكذلك ننجي المؤمنين)، وەفەرمووی: (فلولا أنه كان من المسبحين للبث في بطنه إلى يوم يبعثون).﴿[٤٩] لولا أن تداركه نعمة من ربه﴾ خۆ ئەگەر رەحمەت و میهرەبانیك لە پەروەردگاریەوە فریای نەكەوتبا بە قەبووڵكردنی تەوبەو پەشیمانی لێی ﴿لنبذ بالعراء﴾ فرێ دەدرایە دەشتێكی رووتەن و وشكەوە, واتە: بێ دارو درەخت ﴿وهو مذموم﴾ و سەركۆنەكراویش دەبوو ﴿[٥٠] فاجتباه ربه﴾ جا پەروەردگاری هەڵیبژاردەوە بۆپێغەمبەرێتی ﴿فجعله من الصالحين﴾ لە ریزی صاڵحاندا دایناییەوە، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمووێ: ((لاينبغي لأحد أن يقول: أنا خير من يونس بن متى)) متفق عليه. فتح الباري: ٨،١٤٤.مسلم:١٨٤٦/٤. واتە: بۆ هیچ كەسێ شیاوو رەوا نیە بڵێ: من لە (یونس)ی كوڕی (مەتتا) باشترم. ﴿[٥١] وإن يكاد الذين كفروا﴾ وەبەڕاستی ئەی پێغەمبەر! ﷺ ئەوانەی كە كافر و بێ بڕوابوون نزیكە لەرق ودوژمنایەتیدا ﴿ليزلقونك بأبصارهم﴾ بەچاویان هەڵتدێرن ﴿لما سمعوا الذكر﴾ وەختێ كە قورئانیان بیست.

(ئیبن كەسیر) دەڵێ: (في هذه الآية دليل على أن العين إصابتها وتأثيرها حق بأمرالله عز وجل..). واتە: ئەم ئایەتە بەڵگەیە كە چاوی پیس بەویستی خوا رۆڵ ودۆزی خۆی دەبینی ودەتوانێ زیان بگەیەنێت بەوشتە بۆی

دەڕوانێت، هەروەك چەند فەرموودەیەكیش لەو بارەیەوە هاتوون و دەڵێن: ((لا رقية إلا من عين أو حُمَّةٍ أو دم لا يرقأ)) أبوداود. ٢٩٣/٤. ((العين حق، ولوكان شئ سابق القدر سبقت العين، وإذا استُغْسِلْتُمْ فاغسلوا)مسلم: ١٧١٩/٤. یان دەفەرموێ: ((لا عدوى، ولاطيرة ولاهامة ولاحسد والعين حق)) ئیمامی (ئەحمەد) ریوایەتی كردووە. ﴿ويقولون إنه لمجنون﴾ وە لەگەڵ ئەوەیشدا ئەڵێن: بەڕاستی ئەو (موحەممەد)ـە شێتە! باشە! ئەگەر شێتە بۆچی ئەوەندە بەخەفەتەوەن و لێیدەترسن و، هەر ڕۆژەی توانجێكی لێ ئەگرن؟﴿[٥٢] وما هو إلا ذكر للعالمين﴾ وە ئەو قورئانە تەنها ئامۆژگارییەكە بۆ هەموو خەڵكانی دونیا(بە پەرییو بە ئادەمزادەوە). ئیتر چۆن بەو كەسە -كە ئەم قورئانەی بۆ هاتووە - دەڵێن: شێت..؟! بەڵێ پێغەمبەر هەر لەمەككەدا بووو جیهانییەتی ئیسلام ڕاگەیەنرا.! لەپاڵ ئەو هەموو سزاو ئەشكەنجەو چەوساندنەوە زۆرەدا، خوا دای بەگوێی هەموو خەڵكانی دونیادا كە: ئەو قورئانە بۆهەموو جیهانیانەو، دەبێ باوەڕی پێبێنن.

لە (١٤١٧/١٠/١٠)ك بەرامبەر بە (١٩٩٧/٢/١٧)ز -كاتژمێر (٥، ٤٠) خولەكی پاش نیوەڕۆ- لە تەفسیری سوورەتی (قەڵەم) بوومەوە لە شاری (مەریوان).

زۆر زۆر سوپاس بۆ خوای كارجوان.

*** *** ***

## ٦٩- سوورەتی ( حاقة )ـە
## مەككەییەو ( ٥٢ ) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتی (حاقە)یە پاش سوورەتی (ملك) هاتووە.. وەك سوورەتە مەككە ییەكانی تر باسی چەسپاندنی ئیمان و بیروباوەڕ ئەكات.. باسێكی ئێجگار قورسی ڕۆژی دواییش ئەكات، ئینجا ئەوانەی هەمیشە هەوڵیان دەدا بۆ دەمكوتكردن و بەدرۆخستنەوەی پەیامبەرە كانیان، وەك: (گەلی عاد، سەموود،گەلی لووط، فیرعەون، گەلی نووح) و چەندان كەللە ڕەق و یاخیی بووی تر، هەر وەك باسی بەختیاران و بەدبەختان ئەكات.. دەشتوانین بڵێین: ئەوەرەی سوورەتەكە بۆدووپاتكردنەوەی چەسپاندنی ڕاستیی قورئانە، فەرموودەی خوایەكی زاناو، كارجوان و داناو بینایە.. لەگەڵ پاكانەكردن بۆ پەیامبەر ﷺكە: هەرگیز گومڕاو سەرلێشێواو نەبووە، هەروەك تاوانكاریی و بەدبەختییان لەسەر تۆمار ئەكات.

﴿بسم الله الرحمن الرحيم * [١] الحاقة﴾ كارەساتە سەختەكە (ڕۆژی قیامەت) ڕاستە و دێتە دی وهیچ گومانێكی تێدا نییە ﴿[٢] ماالحاقة﴾ چیە ئەوكارەساتە بەرهەقە ڕوودەدا؟ مەبەست ئەوەیە كە ئەوەندە قورس و گران و سەختە، جێگەی پرسیارو بیر لێكردنەوەیە ﴿[٣] وما أدراك ماالحاقة﴾ تۆ چووزانیت ئەو كارەساتەی ڕوودەدا چییە؟ ئەگەر خواهەندێكیت بۆ باس نەكات ، سەرەڕای ئەوەش هێشتا بەتەواوی لێی حاڵی نابیت تا بەچاوی سەرنەیبینی.. بەڵێ دەبوو ڕۆژێكی ئاوا كەس نكووڵی لێ نەكردایە كەچی ﴿[٤] كذبت ثمود و عاد بالقارعة﴾ سەموود(واتە:هۆزەكەی صالح) وە(عاد) واتە:قەومەكەی(هوود)، بڕوایان بە ڕۆژە تێكشكێنەكەكە نەهێناو، بەدرۆیان زانی.. بۆیە خوای گەورەش لێیان تووڕە بووو لە ناوی بردن، وەك ئەفەرموێ: ﴿[٥] فأما ثمود فأهلكوا بالطاغية﴾ جا هۆزی سەموود-گەلی صالح بەهۆی سەركێشی خۆیانەوە- بە نەعرەتەیەكی ئێجگار گەورە تیا چوون ,پاش بڕینی هەموو بیانووەكانیان، وەك لەئایەتی تردا ئەفەرموێ: (كذبت ثمود بطغواها). ﴿[٦] وأما عاد فأهلكوا بريح صرصر عاتية﴾ وەهەرچی (گەلی)

عادیش بوو–کەخوا پەیامبەرێکی بۆ ناردبوون– بە باو گەردەلوولێکی ساردی سەختی هەرەبەهێز لەنێو چوون ﴿[٧]
سخرها علیهم سبع لیال وثمانیة أیام حسوما﴾ حەوت شەوو هەشت ڕۆژ لەسەریەك: خوا زاڵی کرد بەسەریاند,
دەڵێن لەبەیانی چوارشەممەوە دەستی پێکرد، بۆ ئێوارەی چوارشەممەی ئایندە، چوار ڕۆژی لەکۆتایی (شوبات)و،
سێ ڕۆژیش لەسەرەتای (ئازار)ەوە کەپێی دەڵێن: بورجی پیرەژن، چونکە وەك (مامۆستا خالْ ئەڵێ) پیرەژنێك لەگەڵ
عاد لەژێرزەمینێکدا خۆی دەشارێتەوە تا لەڕۆژی هەشتەما خۆی دەردەخاو ئەویش ڕەق ئەبێتەوە (خواش چاکتر
ئەزانێ). ﴿فتری القوم فیها صرعی کأنهم أعجاز نخل خاویة﴾ جا ئەگەر لەوێ بوایت ئەو گەلەت دەدی لەو شەوان
ورۆژانەدا بە مردوویی کەوتوون وەکو کۆتەرەی پواوی دارەخورما, لە جێیەکی تردا دەفەرموێ: (فأصبحوا لایری
إلامساکنهم) وایان لێهات خانووەکانیان نەبێ هیچ شتێکیان نەئەبینرا، لەفەرموودەیەکی (متفق علیە)یشدا هاتووە:
((نصرت بالصبا، وأهلکت عاد بالدّبور)). فتح الباری: کتاب الإستسقاء ٢/٥٣٠، ومسلم: ٦١٧/٢. واتە: خوا منی بەوبایە سەرخست و, دوژمنی پێ ڕوخاند کە لەخۆرهەڵاتەوە دەهات، (عاد)یشی بەوبایە قڕکرد کە لەخۆر ئاواوە دەهات
﴿[٨] فهل تری لهم من باقیة﴾ جائایا دەبینی کەسیان مابێتەوە..؟ ﴿[٩] وجاء فرعون ومن قبله والمؤتفکات
بالخاطئة﴾ وەفیرعەون وئەوانەی پێش ئەویش لە دانیشتوانی شارو گوندە سەرەو ژێرکراوەکان هاتن ﴿[١٠]
فعصوا رسول ربهم﴾ جا هەریەکەیان بێگوێی و سەرپێچی کرد بەرامبەر بەپێغەمبەری پەروەردگاری خۆیان , فرعەون لەمووسا، گەلی لووط لە(لووط) وەك ئەفەرموێ: (إن کل إلا کذب الرسل فحق وعید) یان دەفەرموێ: (کذبت قوم نوح المرسلین) یان فەرمایشتی (کذبت عاد المرسلین). ﴿فأخذهم
أخذة رابیة﴾جا خوا گرتیانی بە گەرتنێکیلەڕادە بەدەر، هەندێ بەبا، هەندێ بە تۆفان ﴿[١١] إنا لما طغی الماء حملناکم
فی الجاریة﴾ ئێمە کاتێ ئاوەکە سەری کردو بەسەر هەمووشتێکدا سەرکەوت لەکاتی تۆفانەکەدا(باپیرەکانی) ئێوەمان هەڵگرت لە کەشتیدا تا تیانەچن و بنەبڕنەبن.. پاشان ئادەمزاد وردەوردە زاووزێیکردەوەو سەری هەڵدایەوە، ئایەتی: (وجعل لکم من الفلك والأنعام ما ترکبون) وەئایەتی (وآیة لهم أنا حملنا ذریتهم فی الفلك المشحون, وخلقنالهم من مثله مایرکبون) دووپاتی ئەوماناو مەبەستە دەکاتەوە ﴿[١٢] لنجعلها لکم تذکرة﴾ بۆئەوەی ئەو ڕووداوەبکەینە بیرهێنەرەوەو ئامۆژگاریەك بۆتان وبشزانن کەهەرکەسێك بجێت بەگژ پەیامبەرەکەیدا تۆڵەی لێ وەرئەگیرێتەوە ﴿وتعیها أذن واعیة﴾ وەئەوگوێیانەی پارێزەرن , ئەو واقیعەیەبیارێزن لە زیهنداو بۆگەلانی پاش خۆیانی بگێڕنەوە و ئامۆژگاری نەوەکانی خۆیانیان پێبکەن هەتابەدوای ئەو لارولاسارانە دانەچن.

الجزء التاسع والعشرون　　سورة الحاقة

وَجَآءَ فِرْعَوْنُ وَمَن قَبْلَهُۥ وَٱلْمُؤْتَفِكَٰتُ بِٱلْخَاطِئَةِ ﴿٩﴾ فَعَصَوْا۟ رَسُولَ رَبِّهِمْ فَأَخَذَهُمْ أَخْذَةً رَّابِيَةً ﴿١٠﴾ إِنَّا لَمَّا طَغَا ٱلْمَآءُ حَمَلْنَٰكُمْ فِى ٱلْجَارِيَةِ ﴿١١﴾ لِنَجْعَلَهَا لَكُمْ تَذْكِرَةً وَتَعِيَهَآ أُذُنٌ وَٰعِيَةٌ ﴿١٢﴾ فَإِذَا نُفِخَ فِى ٱلصُّورِ نَفْخَةٌ وَٰحِدَةٌ ﴿١٣﴾ وَحُمِلَتِ ٱلْأَرْضُ وَٱلْجِبَالُ فَدُكَّتَا دَكَّةً وَٰحِدَةً ﴿١٤﴾ فَيَوْمَئِذٍ وَقَعَتِ ٱلْوَاقِعَةُ ﴿١٥﴾ وَٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ فَهِىَ يَوْمَئِذٍ وَاهِيَةٌ ﴿١٦﴾ وَٱلْمَلَكُ عَلَىٰٓ أَرْجَآئِهَا ۚ وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَٰنِيَةٌ ﴿١٧﴾ يَوْمَئِذٍ تُعْرَضُونَ لَا تَخْفَىٰ مِنكُمْ خَافِيَةٌ ﴿١٨﴾ فَأَمَّا مَنْ أُوتِىَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ فَيَقُولُ هَآؤُمُ ٱقْرَءُوا۟ كِتَٰبِيَهْ ﴿١٩﴾ إِنِّى ظَنَنتُ أَنِّى مُلَٰقٍ حِسَابِيَهْ ﴿٢٠﴾ فَهُوَ فِى عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ ﴿٢١﴾ فِى جَنَّةٍ عَالِيَةٍ ﴿٢٢﴾ قُطُوفُهَا دَانِيَةٌ ﴿٢٣﴾ كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ هَنِيٓـًٔۢا بِمَآ أَسْلَفْتُمْ فِى ٱلْأَيَّامِ ٱلْخَالِيَةِ ﴿٢٤﴾ وَأَمَّا مَنْ أُوتِىَ كِتَٰبَهُۥ بِشِمَالِهِۦ فَيَقُولُ يَٰلَيْتَنِى لَمْ أُوتَ كِتَٰبِيَهْ ﴿٢٥﴾ وَلَمْ أَدْرِ مَا حِسَابِيَهْ ﴿٢٦﴾ يَٰلَيْتَهَا كَانَتِ ٱلْقَاضِيَةَ ﴿٢٧﴾ مَآ أَغْنَىٰ عَنِّى مَالِيَهْ ۜ ﴿٢٨﴾ هَلَكَ عَنِّى سُلْطَٰنِيَهْ ﴿٢٩﴾ خُذُوهُ فَغُلُّوهُ ﴿٣٠﴾ ثُمَّ ٱلْجَحِيمَ صَلُّوهُ ﴿٣١﴾ ثُمَّ فِى سِلْسِلَةٍ ذَرْعُهَا سَبْعُونَ ذِرَاعًا فَٱسْلُكُوهُ ﴿٣٢﴾ إِنَّهُۥ كَانَ لَا يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٣٣﴾ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ ﴿٣٤﴾

٥٦٧

**چۆڕه سه‌خته‌كانی رۆژی په‌سلان:**

ئینجادێته سه‌رباسكردنی دیمه‌نێكی سه‌خت و قورسی ڕۆژی دوایی وه‌ك ده‌فه‌رموێ: ﴿[13] فإذا نفخ فی الصور نفخة واحدة﴾ جاكاتێ ته‌نیا جارێك فووكرا به‌شه‌یپووردا له‌لایه‌ن (ئیسرافیل)ـه‌وه بۆمراندنی ته‌واوی گیانله‌به‌ران، كه‌ئه‌ویش ته‌نها په‌روه‌ردگار خۆی شێوه‌ی ئه‌و(صوور)ه ده‌زانێ ﴿[14] وحملت الأرض والجبال﴾ وزه‌وییو كێوه‌كان له جێگای خۆیاندا هه‌ڵگیران و به‌رزكرانه‌وه ﴿فدكتا دكة واحدة﴾وئه‌وجار یه‌ككه‌ڕه‌ت دران به‌یه‌كداو هه‌پروون هه‌پروون بوون، وه بوونه زه‌ویه‌كی ته‌خت ﴿[15] فیومئذ وقعت الواقعة﴾ ئه‌و ڕۆژه رووداوه‌كه روئه‌دا (واته:قیامه‌ت به‌رپاده‌بێت) ﴿[16] وانشقت السماء فهی یؤمئذ واهیة﴾ وئاسمان هه‌موو له‌ت وله‌ت بوو، جا ئاسمان له‌و رۆژه‌دا شل وشۆڵه، چونكه له‌و ڕۆژه‌دا وه‌ك خوری شی ده‌بێته‌وه‌و، له‌یه‌كتر ده‌ترازێ، وه‌ك ئه‌فه‌رموێ (وفتحت السماء فكانت أبوابا). ﴿[17] والملك علی أرجائها﴾ وه‌فریشته‌كانیش له سه‌ر لێواری ئاسمانه‌كان ﴿ویحمل عرش ربك فوقهم یومئذ ثمانیة﴾ وه‌له‌و ڕۆژه‌دا هه‌شت فریشته عه‌رشی په‌روه‌ردگاری تۆ به‌بان سه‌ریانه‌وه هه‌ڵ ده‌گرن. پێشینان له‌مانای عه‌رشدا ده‌ڵێن: (إنه سریر ذو قوائم تحمله الملائكة، وهو كالقبّة علی العالم، وهو سقف المخلوقات).

(سید قطب) به‌ره‌حمه‌ت بێ، ئه‌ڵێ: ئێمه نازانین ئه‌وهه‌شته كه‌به‌بان سه‌ریانه‌وه عه‌رش هه‌ڵده‌گرن چین و كێن. هه‌ر وه‌ك نایشزانین چۆن (عرش) هه‌ڵ ئه‌گیردرێ.. ئێمه ئه‌مانه هه‌موو ئه‌ده‌ینه ده‌ستی په‌وه‌ردگارمان، خۆ له‌ولاشه‌وه داوامان لێ نه‌كراوه بیانزانین.. وه‌هه‌ر ئه‌وه‌نده كه‌هه‌ست بكرێ به‌گه‌وره‌یی‌و، ده‌سته‌ڵاتی بێ سنوری خوا، چ له‌دونیادا، چ له‌پاشه ڕۆژدا به‌سه ﴿[18] یومئذ تعرضون لاتخفی منكم خافیة﴾ له‌و ڕۆژه‌دا ئێوه هه‌موو نیشانی خواوه‌ندتان ده‌درێن بۆ حیساب، هیچ كردارو گوفتارێكی نهێنیتان شاراوه لای خوا، پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ئه‌فه‌رموێ: ((یعرض الناس یوم القیامة ثلاث عَرَضات، فأما عرضتان فجدال ومعاذیر، وأما الثالثة فعند ذلك تطیر الصّحف فی الأیدی، فأخذ بیمینه، وأخذ بشماله)) ئه‌حمه‌د، وئیبنی ماجه وترمزیی. واته: له‌ڕۆژی قیامه‌تدا سێ‌جار ئاده‌مزاد له‌پێشانگای خوادا ڕاده‌نوێنرێن: دوو جاریان شه‌ڕه‌قسه‌و بڕوپانوو هێنانه‌وه‌یه، سێیه‌میشیان نامه‌ی كاروكرده‌وه‌كان ده‌درێته ده‌س، جا یا به‌ده‌ستی ڕاسته‌وه ده‌درێت، یان به‌ده‌ستی چه‌په‌وه.

**به‌ختیاران فه‌ره‌حناك و، به‌دبه‌ختان خه‌مناك:**

ئینجا كه ڕۆژه راسته‌كه هات , ئاده‌مزاد ده‌بنه دوو ده‌سته، وه‌ك ده‌فه‌رموێ: ﴿[19] فأما من أوتی كتابه بیمینه﴾ ئینجا ئه‌و كه‌سه‌ی كارنامه‌كه‌ی درایه ده‌ستی راستیی–كه‌ئه‌وه‌ش نیشانه‌ی به‌ختیاریی مرۆڤه– ﴿فیقول هاؤم اقرءوا كتابیه﴾ جا(له‌خۆشیی و شادیدا)به‌ده‌نگی به‌رز ئه‌ڵێ: ها ئه‌وه‌ته نامه‌كه‌م بگرن و بیخوێننه‌وه (چونكه كاتێ كه‌نامه‌كه‌ی درایه ده‌ستیڕاستی ئیتر هه‌ر به‌وه‌زانی به‌ختیاره، بۆیه به‌سه‌ربه‌رزییه‌كه‌وه خۆی ده‌نوێنێ ﴿[20] إنی ظننت أنی ملاق حسابیه﴾ چونكه به‌راستی من له دنیادا ئه‌مزانی و یه‌قینم بوو كه ده‌گه‌م به حیسابی خۆم!! وائه‌مرۆش خوای میهره‌بان پاداشتی به‌چاكه دامه‌وه, وه‌ك له‌سووره‌تی تردا بۆ دووپاتكردنه‌وه‌ی ئه‌و ڕاستیه ئه‌فه‌رموێ: (الذین یظنون أنهم ملاقوا ربهم..) – ﴿[21] فهو فی عیشة راضیة﴾ جا ئه‌وه له گوزه‌رانێكی خۆش و په‌سه‌ندكراوایه ﴿[22] فی جنة عالیة﴾ له‌به‌هه‌شتێكی به‌رزدا ﴿[23] قطوفها دانیة﴾ میوه‌جاتی دره‌خته‌كانی نزیكه لێیه‌وه, واته: ده‌س ڕه‌سه: به‌راوه‌ستانه‌وه، به‌دانیشتنه‌وه ,ده‌ستی ئه‌گاتێ، ته‌نانه‌ت ده‌میشی ئه‌گاتێ، خوای كارزان به‌هیچ شێوه‌یه‌ك نایه‌ڵێ به‌هه‌شتیی ئه‌زیه‌ت بكێشێ، پاش ئازارو ئه‌زیه‌ته‌كه‌ی دونیای ﴿[24] كلوا واشربوا هنیئا بما أسلفتم فی الأیام الخالیة﴾ پێیان ئه‌وترێ: بخۆن و بخۆنه‌وه به خۆشی به‌هۆی ئه‌وكاره‌جوان و چاكانه‌وه

لەڕۆژگارەکانی رابوردوودا ئەنجامتان دەدا. بەکورتیی: مرۆڤی بەهەشتیی لەوپەڕیخۆشییدا دەبیّ. ئینجا تۆڵەی دۆزەخییەکان باس دەکاو دەفەرمویّ: ﴿ ٢٥ واما من اوتی کتابه بشماله﴾ بەڵام ئەوکەسەی: کارنامەکەی ئەدرێتە دەستی چەپی -کە ئەوەش نیشانەی بەدبەختیە- ﴿ فیقول یالیتنی لم اوت کتابیه﴾ جادەڵیّ: خۆزگایە..! نامەکەم پێنەدرابا ﴿ ٢٦ ولم ادر ما حسابیه﴾ و نەمزانیبا سەرئەنجامی لیّ حیساب ولێپرسینەوەم چیە؟ ﴿ ٢٧ یالیتها کانت القاضیة﴾ خۆزگایە ئەو مردنەم براباوە بە یەکجاری و، زیندووش نەکرامایەتەوە ﴿ ٢٨ ما اغنی عنی مالیه﴾ دارایی و ماڵەکەم هیچ کەڵکێکی پێنەگەیاندم بۆئەم ڕۆژەم ﴿ ٢٩ هلك عنی سلطانیه﴾ ئەومولك و دەسەڵاتەی بووم لەدەس چوو، نە ڕشتەم، نە پلەوپایەم، هیچیان نەیانتوانی تۆزقاڵەیەك ئارامم بکەنەوە.

ئەوسا ئیتر خوا فرمان ئەدات بە دەرگاوانەکانی دۆزەخ و ئەفەرمویّ: ﴿ ٣٠ خذوه فغلوه﴾ بیگرن ، جا کەلەبچەی بکەن ، واتە: کۆت و زنجیر لەدەس و قاچ وملی بئاڵێنن ﴿ ٣١ ثم الجحیم صلوه﴾ پاشان بیخەنە ناو ئاگری دۆزەخ ﴿ ٣٢ ثم فی سلسلة ذرعها سبعون ذراعاً فاسلکوه﴾ ئینجا بیخەنە ناو زنجیرێکی حەفتا گەزیەوە جەرەبابەی بدەن، بۆئەوەی پتر ریسوا بێت، ئەگینە خۆتەنها ئاگرەکەی بەسە، ئای ئەوڕۆژە چەندە ڕۆژێکی گران و نارە حەتە، وەرە لە ناو ئاگریشدا هێمان بەو شێوەیە زنجیر بکرێت! ﴿ ٣٣ إنه کان لایؤمن بالله العظیم﴾ چونکە -لەدونیادا- بڕوای بەخوا نەبوو کە ئەمەش گەورەترین ستەمە، بۆیە هەر دەبیّ ئاوا سەرشۆڕو ریسوا بکریّ ﴿ ٣٤ ولا یحض علی طعام المسکین﴾ وەهانی خەڵکی نەدەدا لەسەر خواردن دان بە هەژار. چەند ئاینێکی بەرزو پیرۆزە..! سەرەڕای ئەوەی دەبیّ لەماڵ و منداڵی خۆیان بگرنەوە بۆ هەژاران، دەبیّ مەردومیش دنەو هان بدا بۆ بووژاندنەوەیان ﴿ ٣٥ فلیس له الیوم ههنا حمیم﴾ جائەمرۆش لێرە - واتە:ڕۆژی قیامەت- هیچ دۆستێکی بۆ نیە تا تکایەکی بۆ بکاو تۆزیّ ئەو بارەیەی لیّ سووك بکات. ﴿ ٣٦ ولا طعام إلا من غسلین﴾ وخواردن و خواردنەوەشی هەر کیم و زوخاوی داچۆڕاوی لاشەی دۆزەخییەکانە ﴿ ٣٧ لا یأکله إلا الخاطئون﴾ گوناهباران نەبیّ کەسی دیکە لێی ناخوات, واتە: هەر ئەوانە دەیخۆن کە باوەڕیان بەخوا نەبوو.

الجزء التاسع والعشرون — سورة الحاقة

فَلَيْسَ لَهُ ٱلْيَوْمَ هَٰهُنَا حَمِيمٌ (٣٥) وَلَا طَعَامٌ إِلَّا مِنْ غِسْلِينٍ (٣٦) لَّا يَأْكُلُهُ
إِلَّا ٱلْخَٰطِـُٔونَ (٣٧) فَلَآ أُقْسِمُ بِمَا تُبْصِرُونَ (٣٨) وَمَا لَا تُبْصِرُونَ (٣٩)
إِنَّهُۥ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ (٤٠) وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَاعِرٍ قَلِيلًا مَّا تُؤْمِنُونَ (٤١)
وَلَا بِقَوْلِ كَاهِنٍ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ (٤٢) تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ (٤٣) وَلَوْ
تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ ٱلْأَقَاوِيلِ (٤٤) لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِٱلْيَمِينِ (٤٥) ثُمَّ لَقَطَعْنَا
مِنْهُ ٱلْوَتِينَ (٤٦) فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَٰجِزِينَ (٤٧) وَإِنَّهُۥ لَتَذْكِرَةٌ
لِّلْمُتَّقِينَ (٤٨) وَإِنَّا لَنَعْلَمُ أَنَّ مِنكُم مُّكَذِّبِينَ (٤٩) وَإِنَّهُۥ لَحَسْرَةٌ عَلَى
ٱلْكَٰفِرِينَ (٥٠) وَإِنَّهُۥ لَحَقُّ ٱلْيَقِينِ (٥١) فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ (٥٢)

سُورَةُ المَعَارِج — ترتيبها ٧٠ — آياتها ٤٤

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

سَأَلَ سَآئِلٌۢ بِعَذَابٍ وَاقِعٍ (١) لِّلْكَٰفِرِينَ لَيْسَ لَهُۥ دَافِعٌ (٢) مِّنَ
ٱللَّهِ ذِى ٱلْمَعَارِجِ (٣) تَعْرُجُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيْهِ فِى
يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ (٤) فَٱصْبِرْ صَبْرًا جَمِيلًا (٥)
إِنَّهُمْ يَرَوْنَهُۥ بَعِيدًا (٦) وَنَرَىٰهُ قَرِيبًا (٧) يَوْمَ تَكُونُ ٱلسَّمَآءُ كَٱلْمُهْلِ
(٨) وَتَكُونُ ٱلْجِبَالُ كَٱلْعِهْنِ (٩) وَلَا يَسْـَٔلُ حَمِيمٌ حَمِيمًا (١٠)

يُبَصَّرُونَهُمْ — ٥٦٨

**قورئان کەلامی خوایە:**

جا پاش ئەوە باسێکی گەورەیی قورئان ئەکاو ئەفەرمویّ: ﴿ ٣٨ فلا اقسم بما تبصرون * ٣٩ وما لا تبصرون﴾ جاسوێندم بەو شتانەی ئێوە بەچاو دەیان بینن، و بەوانەش نایان بینن و دەرکی ناکەن لە بوونەوەر, وەکو بەشێکی زۆری دونیا، پاشەڕۆژ، تەن و لەش و ڕۆح، ئادەمیی و، پەریی و فریشتە.. هتد ﴿ ٤٠ إنه لقول رسول کریم﴾ بەڕاستی ئەو قورئانە لە زاری پەیامبەرێکی گەورەو بەڕێزەوە پێتان رادەگەیەنرێت ﴿ ٤١ وماهو بقول شاعر﴾ وە

گوفتارو قسەی شایەر نیە , وەك ئەوبەدبەختانە پێیان وایە، وە پێغەمبەر (شیعر)و هونراوەشی نەبووە, وەئەوانەش کە شارەزای زانست و زانیاریی (عەروون)ن ئەم راستیە بەچاکی دەسەلمێنن کە قورئان شیعر نیە. ﴿قليلا ما تؤمنون﴾ کەچی کەمێکتان باوەڕ دێنن! ﴿[٤٢] ولا بقول كاهن﴾ و وتەو قسەی جووکیش نیە ﴿قليلا ماتذكرون﴾ کەموایە بیربکەنەوەو ئامۆژگاری وەرگرن ﴿[٤٣] تنزيل من رب العالمين﴾ ئەم قورئانە لەلایەن پەروەردگاری جیهانەکانەوە دابەزێنراوە، واتە: نە جادووە، نەوتەی جووکیی وفاڵچیە، بەڵکو تەنها فەرموودەی خوای تاك وتەنیایە ﴿[٤٤] ولو تقول علينا بعض الأقاويل﴾ ئەگەر ئەو پەیامبەرە ﷺ هەندێ قسەی لە سەرمان هەڵبەستبا ﴿[٤٥] لأخذنا منه باليمين﴾ دەستیمان دەگرت ﴿[٤٦] ثم لقطعنا منه الوتين﴾ پاشان رەگی دڵیمان دەبڕێ ﴿[٤٧] فما منكم من احد عنه حاجزين﴾ جا کەسێکتان نە دەبوو بتوانێ بەرهەڵستی‌لێ بکاو لەدەستمان رزگاری بکات، خۆپەیامبەریش ﷺ هەرگیز لەنەخشەی ئێمە لانادا و هیچ شتێکیش لە سەر ئێمە هەڵنابەسێت ﴿[٤٨] وانه لتذكرة للمتقين﴾ و بەڕاستی ئەو قورئانە یاداوەرییە بۆ خۆ پارێزان و خواناسان, ئەوانە ئامادەییان تێدایە پەندوو ئامۆژگاری وەر گرن، ئایەتی (قل هو للذين آمنوا هدى وشفاء) بۆ هەمان ماناوەبەستە. ﴿[٤٩] وانا لنعلم أن منكم مكذبين﴾ وە بەڕاستی ئێمە ئەزانین کە لەنێو ئێوەدا هەندێ هەن ئەم قورئانە بەدرۆ دەدەنە قەڵەم ﴿[٥٠] وإنه لحسرة على الكافرين﴾ وە بێگومان لەرۆژی قیامەتدا قورئان داخ وکەسەرە لە سەربێباوەڕان ﴿[٥١] وإنه لحق اليقين﴾ وە بەڕاستیی‌حەقیشە و گومانی تێدا نیە ﴿[٥٢] فسبح باسم ربك العظيم﴾ جا کەواتە تۆش (ئەی پێغەمبەر ﷺ) ناوی پەروەردگاری گەورەت بەرزو پاك رابگرە,وە هەمیشە تەسبیحات و ستایشی بکە لە بەرامبەرئەو بەهرانەوە پێی بەخشیویت.

لە (١٨/١٧) شەشەڵانی (١٤١٧)ك بەرانبەر بە (٢٥/٢٤) /٢/٩٧)ز لە تەفسیری ئەم سوورەتە بوومەوە.

سوپاس بۆ خوای میهرەبان.

*** *** ***

## ٧٠- سوورەتی ( مەعاریج )ـە
## مەککەییەو ( ٤٤ ) ئایەتە

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

ئەم سوورەتە وەك سوورەتە مەککەییەکانی تر باسی ئیمان و بیروباوەڕە بناغەییەکان دەکا، رۆژی قیامەت و، قۆناغە گران و سەختەکانی، جا بڕواداران و، بێ باوەڕان، ئەوجا پاداش و تۆڵەیان، دەشتوانین بڵێین تەوەرەکەی‌باسی بێ بڕوایانی مەککەیە، کە چۆن ئینکاری زیندوو بوونەوەو پاداش و تۆڵەیان دەکرد، گاڵتەو لاقرتی یان بەبانگەوازەکەی پەیامبەر ﷺ ئەکرد. جا لەسەرەتاوە باسی سەرپێچی و سەرکێشی بێ بڕوایانی مەککە ئەکات، کە چۆن لەفەرمانبەرداری پەیامبەر ﷺ دەرچوون و سووکایەتیان بە بانگەوازەکەی ئەکرد، کاتێ کە بەسزای خوا ئەیترساندن.. نموونەی (نەزری کوڕی حاریس) نموونە دێنێتەوە، ئەو دەمە داوا لە خوا ئەکات کە بەزوویی سزایەك بنێرێ بۆخۆی و نەتەوەکەی, پێش ئەوەی قیامەت بێت! ئەگەر موحەممەد راست بکا. لە هەڕەشەکانیدا: (سأل سائل بعذاب واقع..) ئینجا دووچار بوونی تاوانباران لەو رۆژەدا کە ئەوەندە سەختە ئاسمان وەك مسی تواوەو کێوەکان وەك خوری شیکراوەیان لێ دێت.. سروشتی ئادەمزاد کاتێ کە تووشی نارەحەتییەك ئەبێ، چۆن چرکە چرکی پێ ئەکەوێ و، لەوانەیە لەحەسرەتدا ملی خۆی بشکێنێ، کاتێکیش کە خۆشییەکی ئەوقە دەبێت،

چۆن لووتی بەرز ئەکاتەوەو (ڕاستیی) نابینێ..؟!!. کۆتاییشی بە سوێندی بە پەروەردگاری جیهانەکان دێ کە زیندوو بوونەوە ڕاستەو، پاداش و تۆڵەش دەست پێ دەکاو، ئەوانیش لەدەست دەر ناچن (فلا أقسم برب المشارق والمغارب..).

**خوانەناس بەتالووکەی سزایە، تۆش بە ئارامبە :**

﴿بسم الله الرحمن الرحيم * [١] سأل سائل بعذاب واقع﴾ پرسیارکەرێك لە بێ باوەڕەکانی مەککە (نەزری کوڕی حارس) داوای سزای کرد بێتە سەریان، خۆ هیچ گومانێك نیە هەر بۆیان دێ و پێش دێت، گەلێ جار بە بانگەوازەکەی پەیامبەرو بە ڕۆژی دوایی گاڵتەی ئەکرد، تەنانەت ئەیوت: (اللهم إن كان هذا هو الحق فأمطر علينا حجارة من السماء..). جا بەو بۆنەیەوە – وەك تەبەری دەڵێ–ئەم سوورەتی (مەعاریج)ە دابەزی. ﴿[٢] للكافرين ليس له دافع﴾ ئەو سزابە بۆکافرو بێ باوەڕان هیچ کەس و شتێك نیە بیگێڕێتەوە لێیان , واتە: هەرکات لەلایەن خواوە سزاکە هات, هیچ کەسێك نیە نەهێڵێ دووچاری ئەوان بێت ﴿[٣] من الله ذى المعارج﴾ لەلایەن خوای خاوەن دەسەڵات وخاوەن پلەکان، وەك دەفەرمووێ: ﴿[٤] تعرج الملائكة والروح إليه فى يوم كان مقداره خمسين ألف سنة﴾ فریشتەکان و جوبریل بەرز دەبنەوە بۆلای لەڕۆژگارێکدا کەماوەکەی پەنجا هەزار ساڵە لای موشریك وبێ باوەڕەکان.. واتە: سزاو ئەشکەنجەیان لەهەندێ کاتدا ئەوەندە زۆرە ئەو ڕۆژەیان لێ ئەبێ بەپەنجا هەزار ساڵ، یان بەهەزار ساڵ , وەك لەجێگایەکی تردا هاتووە.. دیارە قیامەت پلە پلەیە، بۆیە جێگای وای هەیە ئەوەندە قورس وسەختە بە هەزار ساڵ لێیان ئەڕوات، جێگای وایشی هەیە بەپەنجا هەزار ساڵ. جا لەو ڕۆژەدا فریشتەو جوبریل بۆ لای خوای میهرەبان سەر دەکەون. ﴿[٥] فاصبر صبرا جميلا﴾ جا ئەی پێغەمبەر! ئارام بگرە لە بەرامبەر داوای ئەو داواخوازەوە بە ئارامگرتنێکی جوان و شیاو بەپلەی تۆ,واتە: هەر گیز سکاڵاو بێزاری تێدا نەبێ وجگە لە خوا سکاڵا بۆ کەسێك نەبەیت ﴿[٦] إنهم يرونه بعيدا﴾ بە ڕاستیئەوان ئەو ڕۆژە بەدوور دەبینن! ﴿[٧] ونراه قريبا﴾ و ئێمەش بەنزیکی ئەبینین ,چونکە بۆ ئێمە هیچی تێناچێت. ﴿[٨] يوم تكون السماء كالمهل﴾ ئەوڕۆژە ئاسمان وەك مسی تواوە , یان وەك ڕەنگی ڕۆن زەیتونی لێ دێ ﴿[٩] وتكون الجبال كالعهن﴾ وکێوەکانیش وەك خوریی شیکراوەی ڕەنگاو ڕەنگیان لێدێ وئەبنە گەردو ئەنیشنە ئاسمان ﴿[١٠] ولا يسأل حميم حميما﴾ هیچ دۆست وخزمێکی نزیك لەحاڵی دۆست وخزمی خۆی ناپرسێ, لەبەر خەریکبوونی بەحاڵی خۆیەوە ﴿[١١] يبصرونهم﴾ بەیەکتر نیشان دەدرێن و یەکتریش دەناسن, واتە: وەنەبێ یەکتر نەناسن، نەخێر، یەکتریش ئەناسن، کەچی لەگەڵ ئەوەیشدا هەر پرسیار نیە لە حاڵی یەکتر، وەك لەسوورەتی تردا ئەفەرموێ: (لكل امرئ منهم يومئذ شأن يغنيه...) ٣٧/٨٠. یان دەفەرموێ: (..واخشوا يوما لا يجزى والد عن ولده، ولا مولود هوجاز عن والده شيئا..)٣١ /٣٣. ﴿يود المجرم لو يفتدى من عذاب يومئذ ببنيه [١٢] وصاحبته واخيه﴾ تاوانبار حەز دەکات بۆ ڕزگار بوونی خۆی لەسزای ئەو ڕۆژە بریتی بدات بە کوڕەکانیی و هاوسەرەکەیی و، براکەی ﴿[١٣] وفصيلته التى تؤويه﴾ وە بەو عێلەی لە خۆی دەگرت و پەنای دەدا ﴿[١٤] ومن فى الأرض جميعا ثم ينجيه﴾ وە ئەوەی لە سەرزەوی هەیە هەیە گشتی بدا لە پاشا ڕزگاری بکات. خۆڕزگاری نابێ، ئەگەرچی ئەوانەیش بکاتە بریتی بۆ خۆی، وەك ئەفەرموێ:﴿[١٥] كلا﴾ نەخێر، بریتیت لێ وەر ناگیرێ، دەسا دەست کۆتاکە ﴿إنها لظى﴾ بەڕاستی ئەو ئاگرە ئاگرێکی بڵێسەداری وایە ﴿[١٦] نزاعة للشوى﴾ داماڵێنەرە بۆ پێسی سەر, واتە: پێسیی سەر هەڵدەقرچێنێ و هەڵیدەکەنێ و دەیبا ﴿[١٧] تدعوا من أدبر وتولى * [١٨]

﴿وجمع فأوعى﴾ ئەو ئاگرە ئەو کەسە بانگ دەکات لەدونیادا پشتی لەهەق و راستی کردبێ و رووی لەفەرمانی خوا وەرچەرخاندبێ و ماڵ و دارایی کۆ کردبێتەوە ولەهەژارانی شاردبێتەوەو بەشی نەدابن.

**مرۆڤ بێ تا پشت و چاو چنۆکە:**

ئینجا دێتە سەرباسی دوو خووی زۆر خراپی ئادەمیی.. کە هەر لەو رۆژەوە دروست بووە، لەگەڵیدا بوون و قەت لەکۆڵی نابنەوە، مەگەر ئیمان و بڕوا بێنێت. ﴿١٩ إن الإنسان خلق هلوعا﴾ بەڕاستیی ئادەمیی بەرچاو برسیی و چاوچنۆك دروستکراوە ﴿٢٠ إذا مسه الشر جزوعا﴾ هەر کەتووشی ناخۆشیی و، هەژاریی و کەمدەستی بوو ماخولانی پێدەکەوێت ﴿٢١ وإذا مسه الخير منوعا﴾ وکاتێکیش تووشی خێرو چاکە بوو لەمەردم ئەیگرێتەوەو بەشی خەڵکی لێ نادات، وەك پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمووێ: ((شر مافی الرجل شح هالع وجبن خالع)). واتە: خراپترینی خەسڵەت بۆ مرۆڤ، چرووکی و چاو چنۆکییە، وە ترسێکی دڵ و جەرگ بڕە. ئەبوو داود. کتاب الجهاد ٣/١٢. ﴿٢٢ إلا المصلين﴾ جگە لە نوێژخوێنەکان ئەوانەیان کە ئەم هەشت سیفەتانەیان تێدایە:- یەکەم: ﴿٢٣ الذين هم على صلاتهم دائمون﴾ ئەوانەی کە لەسەر کاتی نوێژەکانیان بەردەوام و سوورن، نای پچڕن و سەرگەرم نابن بەدونیاوە، ئایەتی: (قد أفلح المؤمنون الذين هم فى صلاتهم خاشعون)یش هەر ئەوماناومەبەستە دوویات دەکاتەوە. لەفەرموودەی دروست و رەوایشدا هاتووە: ((أحب الأعمال إلى الله أدومها وإن قل))فتح الباری، کتاب الإیمان ١/١٠١، ومسلم کتاب صلاة المسافرين ١/٥٤٠. واتە: خۆشەویسترینی کاروکردەوە لای خوا، ئەو کارەیە بەردەوام بێت، ئەگەر زۆر کەمیش بێت!. دووەم: ﴿٢٤ والذين فی أموالهم حق معلوم﴾ ئەوانەی کە مافێکی دیاریکراو لەسامانیاندا هەیە ﴿٢٥ للسائل والمحروم﴾ بۆ داواکار (لەمەردوم) و بۆ بێ بەشکراوی داوانەکەر، چونکە بۆخۆی رووی نیە داوا بکا و، خەڵکیش وا ئەزانن هەیەتی. سێیەم: ﴿٢٦ والذين يصدقون بيوم الدين﴾ ئەوانەی بڕوایان هەیە بەڕۆژی پاداش و تۆڵە و کاریشی بۆ ئەکەن. چوارەم: ﴿٢٧ والذين هم من عذاب ربهم مشفقون﴾ ئەوانەن لەسزای ئەو رۆژەی پەروەردگاریان دەترسن ﴿٢٨ إن عذاب ربهم غير مأمون﴾ بەڕاستی سزای پەروەردگاریان کەس لێی ئەمین نیە , تا پاڵی لێ بداتەوە، کەواتە جێگەی خۆیەتی لێی بترسن. پێنجەم: ﴿٢٩ والذين هم لفروجهم حافظون﴾ ئەوانەی داوێنی خۆیان دەپارێزەن لە حەرام ﴿٣٠ إلا على أزواجهم أو ماملكت أيمانهم﴾ جگە لە ژنەکانیان، یان لە کەنیزەکانیان، واتە: تەنها لەگەڵ ئەوانەدا کاری خۆیان ئەکەن ﴿فإنهم غيرملومين﴾ جا بەڕاستی لەوانە لۆمەوسەرزەنشت کراونین. ﴿٣١ فمن ابتغى وراء ذلك فأولئك هم العادون﴾ ئینجا ئەوەی جگە لەوە بخوازێ وئەو کارە بکات، ئەوانە دەست درێژیکارن و خۆیان ڕانواندووە بۆ سزای خوا. شەشەم: ﴿٣٢ والذين هم لأماناتهم

الجزء التاسع والعشرون — سورة المعارج

يبصرونهم يود المجرم لو يفتدي من عذاب يومئذ ببنيه (١١)
وصاحبته وأخيه (١٢) وفصيلته التي تؤويه (١٣) ومن في الأرض
جميعا ثم ينجيه (١٤) كلا إنها لظى (١٥) نزاعة للشوى (١٦) تدعوا
من أدبر وتولى (١٧) وجمع فأوعى (١٨) إن الإنسان خلق هلوعا
(١٩) إذا مسه الشر جزوعا (٢٠) وإذا مسه الخير منوعا (٢١) إلا
المصلين (٢٢) الذين هم على صلاتهم دائمون (٢٣) والذين في
أموالهم حق معلوم (٢٤) للسائل والمحروم (٢٥) والذين يصدقون
بيوم الدين (٢٦) والذين هم من عذاب ربهم مشفقون (٢٧) إن عذاب
ربهم غير مأمون (٢٨) والذين هم لفروجهم حافظون (٢٩) إلا على
أزواجهم أو ما ملكت أيمانهم فإنهم غير ملومين (٣٠) فمن ابتغى وراء
ذلك فأولئك هم العادون (٣١) والذين هم لأماناتهم وعهدهم راعون
(٣٢) والذين هم بشهاداتهم قائمون (٣٣) والذين هم على صلاتهم يحافظون
(٣٤) أولئك في جنات مكرمون (٣٥) فمال الذين كفروا قبلك مهطعين
(٣٦) عن اليمين وعن الشمال عزين (٣٧) أيطمع كل امرئ منهم
أن يدخل جنة نعيم (٣٨) كلا إنا خلقناهم مما يعلمون (٣٩)

٥٦٩

وعهدهم راعون﴾ ئەوانـەی بۆسـپاردەو پـەیمانیان پـارێزەرن ,هـەرگیز خیانـەت و گـزی لەگـەڵ کەسـدا ناکـەن. حەوتەم:﴿[٣٣] والذين هم بشهاداتهم قائمون﴾ ئەوانەی پابەندی بەشایەتییەکانیان هەڵدەسن, بێ جیاوازی لەنێوان کەسانی دوورو نزیکدا، وەك لەسوورەتی تردا ئەفەرموێ: (..ومن یکتمها فإنه آثم قلبه..) بەقەرە: (٢٨٣)، هەشتەم: ﴿[٣٤] والذين هم على صلاتهم يحافظون﴾ ئەوانەی پارێزگاری نوێژەکانیان دەکەن. واتە بە رێك و پێکی دەست نوێژو پایـەکانی (نوێـژ) دەپـارێزن. ﴿[٣٥] أولئـك فـی جنـات مکرمـون﴾ ئەوانـە -کـە خوورەوشـتیان ئاوایـە- لەباخـەکانی بەهەشتدا لەلایەن خواوە رێز لێگیراون ,بە هەر جۆرێك خۆیان پێیان خۆش بێت.. بێ بڕواکان گاڵتەیان بەبەهەشت و موسڵمانەکان ئەکرد، پێیان وابوو کە ئەگەر بەهەشت راستیش بێت، ئەواپێش موسڵمانەکان ئەکەونەوە، چونکە ئەوان لـەپیاوماقوڵان و گەورەیعەرەبن! جا بـەو بۆنـەوە ئـەو ئایەتـە هـات وفـەرمووی: ﴿[٣٦] فمال الذين كفروا قبلك مهطعين﴾ چیە وا ئەوانەی بێ باوەڕ بوون بەرەو لای تۆ دێن ئەی پەیامبەر! ﴿[٣٧] عن اليمين وعن الشمال عزين﴾ لەلای ڕاست و لەلای چەپەوە دەستە دەستە بە پەڕاگەندەیی, پاشان بڵاوەی لێ ئەکەن و هەڵدێن، وەك لەئایـەتێکی تردا خوا ئەفەرمووێ: (كأنهم حمر مستنفرة فرت من قسورة). بتپەرستەکان دەوری پێغەمبەریان دەداو گاڵتەیان پێدەکردو دەیانوت: ئەگەر ئیماندارەکان وەك موحەممەد ﷺ دەڵێت بڕۆنە بەهەشتەوە, ئەوا ئێمە پێش ئەوانەوە دەڕۆینەبەهەشتەوە, ئینجا ئـەم ئایەتـە دابەزی وفـەرمووی: ﴿[٣٨] أيطمع كل امرئ منهم أن يدخل جنة نعيم﴾ ئایا هەریەك لەوانە بەو حاڵەوە بەتەمایە ببرێتە بەهەشتێکی پڕ لەنازو نیعمەت و پڕ بەهرەوە لەکاتێکدا بڕوایان بەو پەیامبەرە نەبوو؟! ﴿[٣٩] كلا﴾ قەت شتی وانابێت ﴿إنا خلقناهم مما يعلمون﴾ بەڕاستی ئێمە دروستمان کردوون لەوەی خۆیان دەزانن, واتە: ئاوێکی بۆ گەنی قیزەون، پاشان هیچ کارێکی چاکیشیان ئەنجام نەداوە، ئیتر چۆن بەر لەوانـە ئەڕۆنـە بەهەشـتەوە..؟!، وەك ئـەم ئایەتانـەیش بنـەڕەت و بناغـەی مـرۆڤ بـاس ئەکـەن: (ألم نخلقكم من ماء مهين).٢٠/٧٧. (فلينظر الإنسان مم خلق، خلق من ماء دافق).٨٦/٥-٦. ﴿[٤٠] فلا اقسم برب المشارق والمغارب﴾ جـاسوێند بـە خـاوەنی خۆرهەڵاتـەکان وخۆرئاواکـان (ڕۆژو مـانگ و ئەسـتێرەکان). ﴿إنـا لقـادرون﴾ بێگومـان ئێمـە بەتوانا وبەدەسەڵاتین ﴿[٤١] على ان نبدل خيرا منهم﴾ ئەوانە لەناو بەرین و کەسانی باشترو چاکتر بێنینە جێیان ﴿وما نحن بمسبوقين﴾ خۆ بۆئەو مەبەستەش کەسمان پێش نەکەوتووەو لەدەس دەرنەچووە، واتـە: هـەرکات بمانـەوێ ئـەوکارە ئـەنجام ئـەدەین. ئایـەتی: (نحن قدرنا بينكم الموت ومانحن بمسبوقين)٥٦/٦٠. هـەر ئـەو مانایـە دوپات دەکاتەوە. ﴿[٤٢] فذرهم يخوضوا ويلعبوا﴾ جا کەواتە وازیان لێ بێنە -ئەی پەیامبەر!ﷺ- باهەر لەقسەی پڕو پووچدا ڕۆ بچن و گەمە بکەن ,تۆیش بێ وچان کاری خۆت ئەنجام بدە. ﴿حتى يلاقوا يومهم الذى يوعدون﴾ تادەگەن بەو ڕۆژەی هەمووجار بەڵێنیان پێدەدرێ بە سزا, واتە: ڕۆژی قیامەت، جائەو کاتە هیچ شتێك کەڵکیان پێ ناگەیـەنێت ﴿[٤٣] يوم يخرجون من الأجداث سراعا﴾ ئەو ڕۆژەی کەلە گۆڕەکانیان بەپەلە دێنە دەرەوە بۆ لای ئیسرافیل﴿كأنهم إلى نصب يوفضون﴾ دەڵێیت بۆلای بتەکانیان رادەکەن و تاودەدەن ﴿[٤٤] خاشعة أبصارهم﴾ چاویان شۆڕەو, شەرمەزارن ﴿ترهقهم ذلة﴾ زەبوونیەك دایاندەگرێ، بەڕوومەتیانەوە دیارە ﴿ذلك اليوم الذى كانوا يوعدون﴾ ئەوتری:ئەمە ئەو ڕۆژەیـە کە لـەدونیادا بـەڵێنیان پێدرابوو، و ئـەوان گاڵتـەیان پـێ ئـەکرد، وا ئـەمڕۆ بەچاوی خۆیـان پـاداش و تۆڵـەی دەبینن.

زۆر سوپاس بۆ خوای میهرەبان کە یارمەتیدام بۆ تەواوکردنی تەفسیری سوورەتی (معارج).

*** *** ***

## ٧١- سوورەتی ( نووح )ـە

## مەککەبییەو ( ٢٨ ) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئـەم سـوورەتەش وەك سـوورەتە مەککەییـەکانی تـر باسـی ئیمـان و بیروبـاوەڕ ئـەکات.. ئینجا کـەمێك درێـژە بەداستانی پیری پێغەمبەران (شیخ الأنبیاء) نووح ﷺ دەدات هەر لەسەرەتای بانگەوازەکەیەوە، تا (تۆفان)ەکە، کە (٩٥٠) ساڵی رەبەق بوو.. هەر بۆیە بەم سوورەتەش ئەڵێن سوورەتی (نووح)، لەگەڵ پێش چاوخستنی نموونەیەك لە دەسەڵاتی خوای گەورە بەرامبەر بە بێ بڕوایان. جا بۆ یەکەم جار باسی رەوانە کردنی نووح پێغەمبەر دەکات، ئەوجا ئەرکەکانی سەرشانی بۆ راگەیاندنی بانگەوازەکەیی و، ترسـاندنی قـەوم و گەلەکـەی لەسـزای خـوا، ئەگـەر نەگەڕێنـەوە سـەر هێڵـی راست و دروسـت، شـیاوی باسـە چـەندین سـوورەتی تـر بـەو شێوەیە بایـەخ بـەم داسـتانەی (نـووح) دەدەن -سـڵاوی لەسـەر بێـت - وەك سـوورەتی: (شعراء).. و (مؤمنون).. و(أعراف).. و (أنبیاء)، وە زیاتر لە هـەموویان سوورەتی (هـوود)، چونکە نزیکـەی (٢٥) ئایـەت (واتـە: لـە ٢٥ بۆ ٤٩)، باسـی ئـەو پەیامبـەرە بـەرزە دەکـەن ، ئـەم سـوورەتەش نمایشـی ئـەوە دەکـات کـە چـۆن ئـەو پەیامبـەرە سـەروەرە بـە شـەوو بـە رۆژ، بەئاشـکراو بەپەنامـەکی، بـە هـەموو جۆرێـك درێـژەی بـە بانگەوازەکـەی خـۆی داوە.. وەوانـەی مانـدوو نـەبوون و کـۆڵ نـەدان و، نەپسان فێری هەموو تێکۆشەرێك دەکات، لەهەمووی گرنگتر دڵدانـەوەی پەیامبـەرە ﷺ تازیـاتر بـەئارام بێـت و، دان بـە خۆیدا بگرێ.

**بـەکورتیی:** ئـەم سـوورەتی (نـووح)ـە بەشـێوەی کـاری جیهادی لایەنگرانی رێگەی راستیی، بەرامبەر بەلایەنگرانی رێگەی ناراستیی، نمایش دەکا.

الجزء التاسع والعشرون | سُورَةُ نُوحٍ

فَلَآ أُقۡسِمُ بِرَبِّ ٱلۡمَشَٰرِقِ وَٱلۡمَغَٰرِبِ إِنَّا لَقَٰدِرُونَ ﴿٤٠﴾ عَلَىٰٓ أَن نُّبَدِّلَ خَيۡرٗا مِّنۡهُمۡ
وَمَا نَحۡنُ بِمَسۡبُوقِينَ ﴿٤١﴾ فَذَرۡهُمۡ يَخُوضُواْ وَيَلۡعَبُواْ حَتَّىٰ يُلَٰقُواْ يَوۡمَهُمُ ٱلَّذِي
يُوعَدُونَ ﴿٤٢﴾ يَوۡمَ يَخۡرُجُونَ مِنَ ٱلۡأَجۡدَاثِ سِرَاعٗا كَأَنَّهُمۡ إِلَىٰ نُصُبٖ يُوفِضُونَ
﴿٤٣﴾ خَٰشِعَةً أَبۡصَٰرُهُمۡ تَرۡهَقُهُمۡ ذِلَّةٞۚ ذَٰلِكَ ٱلۡيَوۡمُ ٱلَّذِي كَانُواْ يُوعَدُونَ ﴿٤٤﴾

ترتيبها ٧١ | سُورَةُ نُوحٍ | آياتها ٢٨

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِنَّآ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦٓ أَنۡ أَنذِرۡ قَوۡمَكَ مِن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَهُمۡ
عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿١﴾ قَالَ يَٰقَوۡمِ إِنِّي لَكُمۡ نَذِيرٞ مُّبِينٌ ﴿٢﴾ أَنِ ٱعۡبُدُواْ
ٱللَّهَ وَٱتَّقُوهُ وَأَطِيعُونِ ﴿٣﴾ يَغۡفِرۡ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمۡ وَيُؤَخِّرۡكُمۡ
إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمًّىۚ إِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ إِذَا جَآءَ لَا يُؤَخَّرُۚ لَوۡ كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ
﴿٤﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّي دَعَوۡتُ قَوۡمِي لَيۡلٗا وَنَهَارٗا ﴿٥﴾ فَلَمۡ يَزِدۡهُمۡ دُعَآءِيٓ إِلَّا
فِرَارٗا ﴿٦﴾ وَإِنِّي كُلَّمَا دَعَوۡتُهُمۡ لِتَغۡفِرَ لَهُمۡ جَعَلُوٓاْ أَصَٰبِعَهُمۡ
فِيٓ ءَاذَانِهِمۡ وَٱسۡتَغۡشَوۡاْ ثِيَابَهُمۡ وَأَصَرُّواْ وَٱسۡتَكۡبَرُواْ ٱسۡتِكۡبَارٗا
﴿٧﴾ ثُمَّ إِنِّي دَعَوۡتُهُمۡ جِهَارٗا ﴿٨﴾ ثُمَّ إِنِّيٓ أَعۡلَنتُ لَهُمۡ وَأَسۡرَرۡتُ
لَهُمۡ إِسۡرَارٗا ﴿٩﴾ فَقُلۡتُ ٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارٗا ﴿١٠﴾

٥٧٠ | يُرۡسِلِ ٱلسَّمَآءَ

### نووح بێ وچان بانگی قەومەکەی دەکا بۆ لای خوا:

﴿بسم الله الرحمن الرحیم * ١ إنا ارسلنا نوحا إلی قومه﴾ بە ڕاستیی ئێمە (نووح)مان نارده لای هۆزەکەی، -
وەك دەڵێن – لە نیوە دوورگەی عەرەبییدا، پاش ئەوە کە لە (کووفە)دا پلەی پەیامبەرێتی پێدرا: ﴿أن انذر قومك﴾
فەرمانمان پێدا: هۆزەکەت بترسێنەو هۆشیاریان بکەوە ﴿من قبل ان یأتیهم عذاب الیم﴾ پێش ئەوەی سزایەکی ئێش
پێگەیەنەری سەختیان بۆبێت لەلایەن پەروەردگاریانەوە ﴿٢ قال یا قوم إني لکم نذیر مبین﴾ پێی گوتن: ئەی قەوم و
هۆزی خۆم..! بەڕاستی من ترسێنەرێکی ئاشکرام بۆتان ﴿٣ ان اعبدوا الله﴾ پێتان دەڵێم هەر خواپەرستن﴿واتقوه﴾
ولەسزاونافەرمانی خۆ پارێزن ﴿واطیعون﴾ وگوێڕایەڵیم بکەن لەوەی پێتان رادەگەیەنم ﴿٤ یغفر لکم من ذنوبکم﴾

ئەوكات خوا لەگوناحەكانتان خۆش دەبێ ﴿و يؤخركم إلى أجل مسمى﴾ وتەمەنتان درێژ دەكا بۆكاتێكی دیاریكراو (بۆ مردن، واتە:بە ئاسوودەیی و بەهرەمەندی لەژێر سێبەری نیعمەتەكانی خۆیدا دەتانهێڵێتەوە، لەواقیعدا كرداری پیرۆزو رەفتاری جوان و شیرین دەبنە هۆی زیادبوونی تەمەن، وەك پێغەمبەرلەم فەرموودەدا دەفەرموێ: ((صلة الرحم تزيد في العمر)) أخرجه الطبراني. واتە: لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە كە پەیوەندی خزمایەتی ونەبچڕاندنی یەكێكە لەوهۆیانەی تەمەن زیاد دەكات ﴿إن أجل الله إذا جاء لايؤخر﴾ بەراستی ئەوكاتەی خوا دیاریكردووە بۆمردن و تۆڵەو سزا بەهیچ شێوەیەك دواناكەوێ ﴿لو كنتم تعلمون﴾ ئەگەرئێوە بزانن و بەباشی تێبگەن برپیار ئاوایە، جا هەقە ئێوەیش تیژڕەویی بكەن بۆكاری چاك و، لەكاری بەدرەفتاران دووربن.

ئینجا نوح بەمەردانەو پێغەمبەر ئاساییانە چووە گۆڕەپانی تێكۆشانەوە، وە بەهەموو شێوەیەك هەوڵ و تەقەلای لەگەڵ گەلەكەی دا تابەشكو بگەڕێنەوە سەرهێڵی ڕاست، بەڵام تا دەهات ئەوان بەولاوە دەرۆیشتن، بۆیە ئەویش بەناچاری سكاڵانامەو ڕاپۆرتێكی كارەكانی پێشكەش بەپەروەردگاری خۆی كرد ﴿[٥] قال رب إني دعوت قومي ليلا ونهارا﴾ وتی: ئەی پەروەردگارم..! بە ڕاستی من بەشەوو بەرۆژ بانگی گەلەكەمم كرد بۆ ئیمان و تەوحید ﴿[٦] فلم يزدهم دعائي إلا فرارا﴾ كەچی تادەهات زیاتر هەڵ دەهاتن! ﴿[٧] وإني كلما دعوتهم لتغفر لهم﴾ وبەڕاستی هەركات بانگم دەكردن بۆ ئیمان وتەوحید تا تۆ لێیان خۆش ببیت ﴿جعلوا أصابعهم في آذانهم﴾ پەنجەیان دەخستە گوێیانەوە! ﴿واستغشوا ثيابهم﴾ و جل و بەرگەكانیان لەخۆیان دەپێچا,بۆ ئەوە وتەكانم نەبیسن و نەم بینن! وەكو قورەیش بەرامبەر بە قورئان دەیانوت: (.. لا تسمعوا لهذا القرآن والغوا فيه لعلكم تغلبون)٤١/٢٦. ﴿واصروا واستكبروا استكبارا﴾ وە پێیان لەسەر بێ بڕوایی داگرت و، خۆیان زۆر بەگەورە زانی شوێنم بكەون ﴿[٨] ثم إني دعوتهم جهارا﴾ ئینجا من بانگەوازەكەم بۆ ئاشكرا كردن ﴿[٩] ثم إني أعلنت لهم وأسررت لهم إسرارا﴾ وە هەندێ جاریش بەنهێنی لەگەڵیان دوام و بانگەوازەكەم پێگەیاندن، واتە: هەموو ڕێگایەكی بانگەوازم گرتەبەر بۆیان، تا بەڵكو بەرەو تۆ بیانهێنم ﴿[١٠] فقلت استغفروا ربكم إنه كان غفارا﴾ جا بەردەوام پێم گوتن: داوای لێخۆشبوون لەپەروەردگارتان بكەن، چونكە هەمیشە گوناحپۆشە, وەك پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ((والذي نفسي بيده لولم تذنبوا لذهب الله بكم وجاء بقوم يذنبون فيستغفرون الله تعالى فيغفر لهم)) رواه مسلم، واتە: سوێند بەو زاتەی كە گیان و رۆحی منی بەدەستە، خوا ئەوەندە بەخشینی لاخۆشە، ئەگەر ئێوە گوناح نەكەن، ئەوا لەناوتان دەباو هۆزی تر دێنێ تا ئەوان گوناح بكەن و داوای بەخشینی لێبكەن و، ئەویش لێیان خۆش ببێت.

ئەوجا نووح عليه السلام فەرمووی: ئەگەر ئێوە بڕوابێنن و مل راكێشن بۆ فەرمانەكانی خوا، ئەو دەمە ئەویش ئەم پێنج شتەتان بۆ ئەكا:

یەكەم: ﴿[١١] يرسل السماء عليكم مدرارا﴾ بارانتان پەیتا پەیتاو بەلێزمە بۆ بەردەداتەوە.

دووەم و سێیەم: ﴿[١٢] ويمددكم بأموال وبنين﴾ وە دارایی و كوڕی زۆرتان پێ دەبەخشێت، كە ئەو دووشتە لەناو جۆرە مرۆڤێكدا مایەی سەروەریین.

چوارەم: ﴿ويجعل لكم جنات﴾ چەندین باخات و بێستانتان دەداتێ كەجوانترین هۆن بۆ رابواردن و خۆشی گەلان.

پێنجەم: ﴿ويجعل لكم أنهارا﴾ ئاوو ڕووباری زۆریشتان بۆ بەدی دێنێت كە لەژێر بنكی درەختەكانیەوە، ئەو چۆمە ئاوە دێ و دەڕوات.

نووح (عليه السلام) هۆشیاریان ئەکاتەوە کە هۆی بێ ڕۆزی وبێ پیتی زەویی وزارو مەڕومالاتیان و، کەمی نێرینەکانیان گوناح و تاوان وبێ باوەڕییە.. دەسا ئێوە باوەڕ بێنن ئەی قورەیش! ﴿[١٣] مالكم لا ترجون لله وقارا﴾ چیتانە لە گەورەیی و شکۆمەندی خوا ناترسن؟! ﴿[١٤] وقد خلقكم اطوارا﴾ خۆ بێگومان ئێوەی بەچەند قۆناغێ دروستیکردووە: تنۆکێ ئاو، خوێنپارە، گۆشتپارە.. هتد) ﴿[١٥] الم تروا كيف خلق الله سبع سموات طباقا﴾ ئایا نەتانبینیوە چۆن خوا حەوت چین ئاسمانی نهۆم لەسەر نهۆم دروستکردووە..؟ ﴿[١٦] وجعل القمر فيهن نورا﴾ و مانگی کردووە بەهۆی ڕووناکی تیایانا, واتە: ئاسمانی یەکەمی پێ ڕووناك کردۆتەوە، وە بەهەموو ئەستێرەکانیش چونکە ئەوانیش هەریەکەیان مانگێکی خۆی هەیە ﴿و جعل الشمس سراجا﴾ و خۆریشی کردووە بەچرا و هەموو بوونەوەر سودی لێوەرئەگرێ، وەك لەم جێیەدا ئەفەرمووێ: (هو الذي جعل الشمس ضياء والقمر نورا وقدره منازل لتعلموا عدد السنين والحساب)١٠/٥. ﴿[١٧] والله انبتكم من الأرض نباتا﴾ وە خوای تاك و تەنیایە ئێوەی لە توخمەکانی زەوی ڕوواندونی بەڕوواندن وەك ڕووەك و گیا ﴿[١٨] ثم يعيدكم فيها﴾ پاشان - دوای مردنتان- ئەتانگێڕێتەوە بۆ ناوی و لەوێ بەفەرمانی خۆی ئەشاردرێنەوە ﴿ويخرجكم إخراجا﴾ و ئەتانهێنێتەوە دەرێ , لە زەوی بەدەرهێنان, واتە: زیندووتان ئەکاتەوەو بەدادگەرانەش پاداش و تۆڵەتان دەست ئەکەوێتەوە ﴿[١٩] والله جعل لكم الأرض بساطا﴾ وە هەرخوایە زەوی بۆ ئێوە ڕاخستووە و بەڕاخستنێك لەسەری قەرار بگرن ﴿[٢٠] لتسلكوا منها سبلا فجاجا﴾ تا بەئاسانی بەڕێگا فراوان و دۆڵەکانیدا بڕۆن, دەسا بۆ وردنابنەوەو بیرناکەنەوە.. تا ئیمان و باوەڕ بێنن..؟!

سورة نوح — الجزء التاسع والعشرون

يرسل السماء عليكم مدرارا (١١) ويمددكم بأموال وبنين ويجعل
لكم جنات ويجعل لكم أنهارا (١٢) ما لكم لا ترجون لله وقارا (١٣)
وقد خلقكم أطوارا (١٤) ألم تروا كيف خلق الله سبع سماوات
طباقا (١٥) وجعل القمر فيهن نورا وجعل الشمس سراجا (١٦)
والله أنبتكم من الأرض نباتا (١٧) ثم يعيدكم فيها ويخرجكم
إخراجا (١٨) والله جعل لكم الأرض بساطا (١٩) لتسلكوا منها
سبلا فجاجا (٢٠) قال نوح رب إنهم عصوني واتبعوا من لم يزده
ماله وولده إلا خسارا (٢١) ومكروا مكرا كبارا (٢٢) وقالوا
لا تذرن آلهتكم ولا تذرن ودا ولا سواعا ولا يغوث ويعوق
ونسرا (٢٣) وقد أضلوا كثيرا ولا تزد الظالمين إلا ضلالا (٢٤)
مما خطيئاتهم أغرقوا فأدخلوا نارا فلم يجدوا لهم من دون
الله أنصارا (٢٥) وقال نوح رب لا تذر على الأرض من الكافرين
ديارا (٢٦) إنك إن تذرهم يضلوا عبادك ولا يلدوا إلا فاجرا
كفارا (٢٧) رب اغفر لي ولوالدي ولمن دخل بيتي
مؤمنا وللمؤمنين والمؤمنات ولا تزد الظالمين إلا تبارا (٢٨)

٥٧١

**نووح نزای شەڕ لە قەومەکەی دەکا:**

پاش ئەوەی نووح -سەلامی لەسەربێ- بەهەموو شێوەیەك لەگەڵ گەلەکەیدا هەوڵیدا و، بێ هیواو بێ ئومێد بوو ﴿[٢١] قال نوح رب﴾ وتی: ئەی پەروەردگاری من..! ﴿إنهم عصوني﴾ بەڕاستی ئەوانە سەرپێچیان کردم ﴿واتبعوا من لم يزده ماله و ولده إلا خسارا﴾ وە کەوتنە شوێنی ئەوکەسە کە دارایی و منالی هیچی بۆ زیاد نەکرد جگە لە زیان, واتە: شوێنی خاوەن سەروەت و خاوەن کوڕانی قەومەکەیان کەوتن, ئەوانیش پێیان وابوو کەئەگەر پەیڕەوی لە نووح بکەن دەسەلاتەکەیان نامێنێ. جا بۆئەوە فروفێڵیان لە هەژارەکانیش کردو بەرەو خۆیان بردنیان و، دەرەنجام ئەمانیش وەك ئەوان دووچار بوون ﴿[٢٢] و مكروا مكرا كبارا﴾ وئەوانیش پیلان و فرو فێڵێکی گەورەیان بۆ دارشتن و, بەئاشکرا هانی خەڵکەکەیان دەدا بۆ ئازاردانی نووح (عليه السلام). جا لەڕۆژی قیامەتیشدا ئەمان بەسەرانیان ئەڵێن: (.. بل مكر الليل والنهار إذ تأمروننا أن نكفر بالله و نجعل له أندادا..)٣٤/٣٣.

**بتەکانی قەومی نووح:**

﴿[٢٣] وقالوا لا تذرن آلهتكم﴾ پیاو خراپە زلە زلەکانیان بە شوێنکەوتووەکانیان گوت: قەت واز لەخواکانتان مەهێنن!! ﴿ولا تذرن ودا ولا سواعا ولا يغوث ويعوق ونسرا﴾ وە واز لە (وەدد) و (سوواع) و (یەغووس) و (یەعووق) و (نەسر)یش مەهێنن.

بەڵێ بۆ دواییش بتپەرستی وردە وردە پەرەی سەندودرێژەی کێشاو لەگەڵ ڕۆژگاردا هات ,چونکە: یەکەم: قەوم و گەلێکی زۆر کۆن هەبوون پێیان وابوو کە هەرچی شتە ئەستێرە ئەیکات، جا لەبەرئەوە ئەیانپەرستن! تەنانەت وێنەو نیگاریان بۆ دەرازاندنەوە..! لەپاشان دەچوون وێنەکانیان ماچ ئەکردن و، بەپیرۆزیان دائەنان و داوای کورو رزق و شفای نەخۆشیان لێدەکردن، ئەمانە پێیان دەگوترا (صابئين). دووەم: هەندێ لەپیاو صالح و چاکەکان لەبەر پیرۆزی وسوود وەرگرتن لە کارە جوانەکانیان و، بۆ ئەوەی لەیادیان نەچن وێنەیان بۆ دروستدەکردن و دایان دەنان ئینجا ماچیان ئەکردن و، بۆماوەیەکی دوورتریش پەرستنیان و سووجدەشیان بۆبردن!. ئینجا ئا لێرەدا دەرئەکەوێ کە بۆچی ئایینی پیرۆزی ئیسلام وێنەو پەیکەرو ڕازاندنەوەی گۆڕی مردووان قەدەغە دەکات, جگە لەوەیش تا گێلە پیاوو پیرێژن و نەزانەکان هەڵ نەخەڵەتێنن و، داوای ماڵ و منداڵ و شفای نەخۆشیان لێنەکەن. ئاشکرایشە سەردانی گۆڕستان پێغەمبەر بەشتێکی سووننەتی داناوە، تا ئاخیرەتت وەبیر بێنێتەوە.. بەڵام بەداخەوە ئێستا لەسەر گۆڕەکان شتی وا ئەکرێ، هێمان پێشی نەفامیەتیش کەوتوونەتەوە ﴿[٢٤] وقد أضلوا كثيرا﴾ وەبێگومان ئەوانە جگە لەخۆشیان" زۆریان گومڕاکرد ﴿ولا تزد الظالمين إلا ضلالا﴾ وەخوایە تۆیش هیچ شتێ زیاد مەکە بۆ ستەمکاران, جگە لەگومڕایی , نووح سەلامی لە سەر بێ پاش هەوڵە هەمە جۆرەکانی وکەڵك نەبوونیان بۆیان ئەو دوعایەی لێکردن، وەك مووسا ﷺ نزای شەڕی لەفیرعەون کردو وتی: (ربنا اطمس على أموالهم واشدد على قلوبهم فلا يؤمنوا حتى يروا العذاب الأليم). ١٠/٨٨.﴿[٢٥] مما خطيئاتهم اغرقوا﴾ بەهۆی گوناحەکانیانەوەبە تۆفان نقومکران وخنکان ﴿فأدخلوا نارا﴾ دەرەنجام خرانە ناو ئاگرێکی گەورەوە ﴿فلم يجدوا لهم من دون الله أنصارا﴾ جا جگە لەخوا هیچ یارمەتیدەرێکیشیان دەست نەکەوت (نە بت، نە سەرۆکخێڵ و هۆز.

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێش: ئایا ئەو تۆفانە ئەوانی خنکان, هەموو زەویی گرتەوە؟ یاخود نا، وەڵامی ئەو پرسیارە لەقورئاندا نەهاتووە.. ئەوەندە نەبێت کە دەڵێت: ئاو لەهەموو لایەکەوە، تەنانەت لەنێو تەنوورەکانیشیانەوە هەڵقوڵی، ئەوجائەوانەی کە بڕوایان بە نووح هێنابوو سواری کەشتییەکە بوون و, ئەویش وەك کێو بەسەر شەپۆلی ئاوەکەدا دەچوو، پاشان لەسەر کێوی (جوودی -گوودیی) کە لەخۆرهەڵاتی (دجلە)وەیە لەکوردستانی تورکیا لەجێگایەك کەپێی ئەڵێن: (ئەرارات) لەنگەری گرتوو سەقامگیر بوو.

دیارە نووح زۆر سزای دەروونیی چێشتووە بۆیە زۆر بەتوڕەییەکەوە ئەفەرموێ: ﴿[٢٦] وقال نوح رب لاتذر على الأرض من الكافرين ديارا﴾ ئەی پەروەردگارم! تەنها بێباوەڕێکیش لەسەر زەویی بەزیندوویی مەهێڵەوە (واتە:هەموویان لەناوببە)، جا خوای گەورەیش وەڵامی دایەوەو، هەموو تیاچوون, تەنانەتی کوڕەکەی خۆیشی، چونکە فەرمانبەرداری نەکردو لێی وەدوورکەوتەوەو گوتی: (.. سآوي إلى جبل يعصمني من الماء).١١/٤٣). ﴿[٢٧] إنك إن تذرهم يضلوا عبادك﴾ چونکە ئەگەر تۆ وازیان لێبێنیت هەرچی بەندەکانتن لەڕێ لائەدەن و گومڕایان دەکەن ﴿ولا يلدوا إلا فاجرا كفارا﴾ وەهیچ منداڵێکیشیان نابێ، مەگەر بێ بڕواو خوا نەناس ,چونکە مناڵێك لەئایندەدا لەکۆشی ئەوانەدا پەروەردە ببێت، گومان نیە کە هەر وەك خۆیان دەر دەچێت، چونکە کەسێك کە (٩٥٠) ساڵ لەناو

گەلێکدا بژیی، لە وردو درشتیان دەناسێت و دەشزانێت چی لەبارەیاندایە , بۆیە ئەو داوایە دەکات ﴿[٢٨] رب اغفر لی ولوالدی ولمن دخل بیتی مؤمنا﴾ ئەی پەروەردگارم! لەخۆم و دایك و باوکم و ئەوانە خۆش ببە کە دێنە ماڵم بەئیمان و باوەڕەوە ﴿وللمؤمنین والمؤمنات﴾ وە لە پیاوانی بڕوادارو، ژنانی بڕواداریش ﴿لا تزد الظالمین إلا تبارا﴾ وە هیچیش بوستەمکاران زیاد مەکە جگە لە نابوود بوون وتیاچوون.

کۆتایی تەفسیری سوورەتی (نووح) هات.

*** *** ***

## ٧٢- سوورەتی ( جن )ـە
## مەککەیی یەو ( ٢٨ ) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئـەم سـوورەتە وەك سـوورەتە مەکەیی‌یـەکانی تـر بـاس لەبنـەما سـەرەکییەکان دەکـات: یـەکخوا پەرسـتیی، پەیامەکەی خوا، پاداش و تۆڵە.. بەڵام تەوەرەکەی باسی (جن) و پەریەکانەو.. هەر شتێکیش پەیوەندی بەوانەوە ببێ.

جنۆکە: جۆرێکن لە دروستکراوەکانی خوای میهرەبان کە –لەسەر شێوەی خۆیان– بەچاو نابینرێن، و ئەوان بەر لە (ئادەم) ﷺ لە ئاگر دروستکراون.

جن یەکێکە لە غەیبیات کە موسڵمانان هەر لەدێرین ڕۆژگارەوە، بڕوایان هێناوە بەبوونی و، قورئانی پیرۆزو پەیامبەری خواش ﷺ بەدرێژە باسیان لێدەکەن، ئێمەی موسڵمانیش بێگومان ودوودڵی گوێڕایەڵ و ملکەچین، چونکە لەوە بەولاوە هیچمان پێ ناکرێ و، پێناوترێ, قسە لەجنۆکەکان دەکرێت هەر لەگوێگرتنیانەوە بۆ قورئان، تا بڕوا هێنانیان.. هەندێ هەواڵی سەر سوڕهێنەریان دێنێت.. جا بۆ یەکەم جار باسی گوێگرتنی دەستەیەکیان ئەکات، بەتایبەت ئەو دەمەی کە گوێیان لەقورئانەوە بوو پاشان بڕوایان پێی هێنا. بوخاریی ئەگێڕێتەوە کە پەیامبەر ﷺ لەگەڵ چەند کەسێك لە هاوەڵانی چوو بۆ بازاڕی (عکاظ), جا لە چۆڵی (نەخلە) دابەزیی و نوێژی بەیانی بەکۆمەڵ کردو، ئینجا چەند کەسێك لەجنۆکەکان بەلایانا تێپەڕین و، گوێیان لەقورئان خوێندنەکەی پەیامبەرەوە بوو ﷺ، هەڵوێستەیەکیان کردو گوێیان بۆ قورئانەکە گرت و بەوردی دڵیان دایە، جا پاش ئەوە بڕوایان هێنا کە: ئەمە فەرموودەی خوایەو بۆ پەیامبەرەکەی هاتووە، شیاوی باسە کە بڵێین پێغەمبەر ﷺ نەبە چاو دیتبوونی، وە نەپێیشی زانیبوون کە لەو دەمەدا گوێیان گرتووە.. جا خوای‌کارزان (قل أوحی إلی أنه استمع نفر من الجن) نارد/. دواتر دەڕواتە سەرباسی سوپاس و ستایش کردنیان بۆ خواو، داننانیان بەتاك و تەنیاییدا، وە بەگەوج و نەفام دانانی ئەوانەی هاوبەش بۆ خوا دائەنێن.

ئەوسا دێتە سەرباسی هەوڵدانیان بۆ دزینی وشەو قسە لەفریشتەکان و، ئینجا هەڵدانی پزیسك بەدوایاندا و سووتاندنیان، ئەڵبەت پاش هاتنی پەیامبەر ﷺ دەبنە دوو بەشەوە ئیماندارو موسڵمان، وە دەرەنجامیشیان.. بانگەوازەکەی پەیامبەرو کۆبوونەوەی جنۆکەکان لەدەوروبەریدا کاتێ کە لەنوێژی بەیانیدا قورئانی ئەخوێند.. دەبێ پەیامبەر ﷺ دەسەڵاتی خۆی –بەرامبەر بەدەسەڵاتی خوا– رابگەیەنێ و، هەموو کەس پێی بزانێ کۆتاییشی دێت بەوە کە زانست و زانیاریی تەواو بەشتە نادیارەکان تەنها لای خوایە، هەرئەو غەیب ئەزانێ. مەگەر کەسێك ئەو خۆی ئاگاداری بکات. جا بۆ زێدە ئاگاداریی و، زانیاریی لەم باسەیە پێم باش بوو پێکەوە ئەم چەند دێڕەی

خوارەوە لەکتێبەکەی: (لالەکائی) و، لێکۆڵەرەوەکەی، لەکتێبی (شرح إعتقاد أهل السنة والجماعة) بەرگی/٤ل١٢٩١. بخوێنینەوە کە ئەڵێت:

یەکەم: ئەهلی سوننەت و جەماعەت , ئیمان و ڕایان لەسەر ئەوەیە کە (شەیتان) و (جن) هەر دووکیان هەن، ئەمەش بە پێچەوانەی ڕاو بۆچوونی (فەلاسیف)ە!.

(ئیبن تەیمیە) ڕەحمەتی خوای لێ بێ ئەڵێت: (وجماهیر الأمم یقرون بالجن ولهم معهم وقائع یطول وصفها، ولم ینكر الجن الا شرذمة قلیلة من الجهال المتفلسفة والأطباء ونحوهم/الفتاوی٣٢-١٩. لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە کە: (جن)یەکان ئەبیستن، قسە ئەکەن، تێدەگەن وژیریی و فامیان وەك ئادەمی هەیەو تەکالیفی شەرعییان لە سەرە: (وما خلقت الجن والإنس إلا لیعبدون) الذاریات/٥٦. (قل أوحی أنه استمع نفر من الجن فقالوا إنا سمعنا قرآنا عجبا..) لە فەرموودەیشدا هاتووە کە پێشەوا (بوخاریی) لە (ئەبوو هورەیرە)وە دەگێڕێتەوە: ((أمرنی النبی ﷺ أن أحتفظ بزكاة رمضان، وأتانی آت من اللیل فجعل یحثو من الطعام فأخذته فقلت لأرفعنك إلی رسول الله ﷺ قال: دعنی فإنی محتاج وحالي شدیدة وعلي عیال فخلیت سبیله، فلما أصبح قال النبي ﷺ: یا أبا هریرة ما فعل أسیرك اللیلة..؟ قال: یا نبی الله: زعم أنه محتاج وحاله شدیدة فرحمته، قال: أما إنه قد كذبك وسیعود. فلما كان اللیلة الثانیة وجده فخبأ فأخذه فقال: لأرفعنك إلی رسول الله ﷺ زعمت أنك لاتعود فقد عدت، قال دعنی فإنی محتاج و حالی شدیدة فخلی سبیله فلما اصبح قال النبي ﷺ یا أبا هریرة! ما فعل أسیرك اللیلة؟ قال: یا رسول الله ﷺ: شكی حاجة وعیالا واني رحمته فخلیت سبیله قال: قال أما إنه قد كذبك وسیعود، فلما كان اللیلة الثالثة وجده فعجبنا فأخذه، فقال: لأرفعنك إلی رسول الله ﷺ هذا آخر ثلاث لیال زعمت أنك لا تعود ثم تعود، قال دعنی أعلمك كلمات ینفعك الله بها قال: وكانوا حریصین علی الخیر. قال إذا أخذت مضجعك فاقرأ آیة الكرسی من أولها إلی آخرها فإنه لن یزال علیك من الله حافظ ولا یقربك شیطان حتی تصبح. فقال النبی ﷺ: ما فعل اسیرك اللیلة..؟ قال: یا نبی الله علمنی كلمات زعم أن الله ینفعنی بها قال: وماهی؟ قال: أمرنی أن أقرأ آیة الكرسی من أولها إلی آخرها فإنه لن یزال علي من الله حافظ ولا یقربنی شیطان حتی أصبح. قال: أما إنه قد صدقك وهو كذوب أتدری من یخاطبك یا أبا هریرة..؟! قال لا، قال فذاك شیطان)).کورتەی مانای ئەم فەرموودەیە ئەمەیە کە: ئەبوو هورەیرە خوای لێ ڕازی بێ فرمانی پێکرا کەسەرفیترەی مانگی ڕەمەزان چاك هەڵگرێ و بیپارێزێ کەچی سێشەو لەسەریەك، یەکێك لە جن پەیدا ئەبێ و بەشێك لەخۆراکەکەی دەباو، ئەمیش هەرسێ شەوەکە ئەیگرێت و، ئەیەوێت بیبات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ بەڵام ئەمان و تەوبە دەکات و دەڵێ: موحتاجم و ئەمجارە وازم لێ بێنە مەرج بێت ئیتر نەیەمەوە، بەڵام هەرسێ جارەکە پەیمان و بەڵێنەکەی ئەشکێنێ و هەر دێتەوە.. لەشەوی کۆتاییدا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەبوو هورەیرە! زانییت ئەوە کێ بوو..؟! وتی:نەخێر, ئەویش فەرمووی: ئەوە شەیتان بوو!. (ئیبن حەزم) کاتێك قسە لە (جن و شەیتان) ئەکات ئەڵێت: (وقد جاء النص بذلك وبأنهم أمة عاقلة ممیزة متعبدة موعودة، متوعدة متناسلة یموتون، وأجمع المسلمون كلهم علی ذلك, نعم والنصاری والمجوس والصابئون وأكثر الیهود حاشا السامرة فقط فمن أنكر الجن أو تأول فیهم تأویلا یخرجهم به عن هذا الظاهر، فهو كافر مشرك حلال الدم و المال. قال تعالی: (افتتخذونه وذریته أولیاء من دونی). وە ئەم فەرموودەیەش هاتووە: ((إن الجن علی ثلاثة أثلاث: فثلث لهم أجنحة یطیرون فی الهواء، وثلث حیات وكلاب، وثلث یحلون ویطعنون)). رواه الحاكم فی المستدرك/٢/٤٥٦، وقال: صحیح الإسناد ووافقه الذهبی. دووەم: قورتوبی.. لەتەفسیرەکەیدا ئەڵێت: (بەپێی ڕەواڵەتی دەقی قورئان و فەرموودەکان, پێغەمبەر ﷺ جنیەکانی

نەدیتووە، ئیمامی (موسلیم) و (ترمزی) لە (ئیبن عەباس)ـە وە دەگێڕنەوە: ((ما قرأ رسول الله ﷺ على الجن وما رآهم...)). واتە: پێغەمبەر ﷺ: نە قورئانی بەسەر جندا خوێندەوە، نەبینینیشی، بەڵکو هەر گوێیان بۆ گرتبوو. بەڵام لەڕیوایەتێکی دیکەدا پێشەوا (موسلیم) لە (عامیری شەعبیە)وە هێناویەتی: ((..أتاني داعي الجن فذهبت معه فقرأت عليهم القرآن)) ئەم فەرمودەیە بەڵگەیە لە سەر ئەوەی دیونی و قورئانی بەسەردا خوێندوون، وە ئیمامی (بەیهەقی) ئەڵێت: (وليس بممتنع أن يراهم النبي ﷺ في صورهم كما يرى الملائكة). (بەندە)ش ئەڵێ: بۆ پێغەمبەران دروست بووە جن ببینن.

سێیەم: سەبارەت بەوە کە (جنیی بڕواتە نێو لاشەو جەستەی ئادەمیەوە، ئیمامی (ئیبن تەیمیە) ئەڵێت: (دخول الجن في بدن الإنسان ثابت بإتفاق أهل السنة والجماعة). وەگوتویەتی: (وليس في أئمة المسلمين من ينكر دخول الجني في بدن المصروع وغيره، ومن أنكر ذلك وادعى أن الشرع يكذب ذلك، فقد كذب على الشرع، وليس في الأدلة الشرعية ما ينافي ذلك).



**جن گوێیان بۆ قورئان گرت و ئیمانیان پێ هێنا:**

﴿**بسم الله الرحمن الرحيم** * [1] **قل اوحى إلى انه استمع نفر من الجن**﴾ ئەی پێغەمبەر! ﷺ بڵێ: لەلایەن پەروەردگارمەوە وەحیم بۆ کراوە کە چەند کەسێك لەجنیەکان گوێیان راگرت بۆ قورئان خوێندنەکەم ﴿**فقالو إنا سمعنا قرآناً عجبا**﴾ جاوتیان: بێگومان ئێمە گوێمانگرت بۆ قورئانێکی سەیروسەمەرە لەڕووی هۆنینەوەو، ڕەوانبێژیی و، خۆشخوانیەوە، واتە: هەقە عەرەبەکانیش پتر تیژڕەوییان کردبا بۆ بڕواهێنان پێی، چونکە بەزمانی ئەوان هاتووە، چاك تێئەگەن و دەزانن کە چەندە ڕەوانبێژە... کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هەر ئەمڕۆو سبەینێ ئەکەن! بەڵام جینیەکان هەر ئەو دەمەی کە بیستیان موسڵمان بوون ﴿ [2] **يهدي إلى الرشد فآمنا به**﴾ ئەو قورئانە، هیدایەت و ڕێنمایی دەکات بۆ ڕێی ڕاست و هەق , ئێمەش بڕوامان پێهێنا ﴿**ولن نشرك بربنا أحدا**﴾ وەهەرگیز هیچ کەسێك ناکەینە شەریك و هاوبەشیی پەروەردگارمان ﴿ [3] **وانه تعالى جد ربنا**﴾ وە بەڕاستی گەورەیی ومەزنی پەروەردگارمان بەرزوبڵندە ﴿**ماتخذ صاحبة ولا ولدا**﴾ نە هیچ ژن ونەهیچ منداڵێکی بۆ خۆی دانەناوە ,چونکە ئەوانە بۆ پێویستین، خواش لەهەموو شتێك بێ نیازە، قسەی ئەم جنیانەش بۆ بەدرۆخستنەوەی عەرەبەکانە کەئەوان پێیان وابوو خوا لەجنۆکەکان ژنی هێناوەو، فریشتەکان لەو ژنەن ﴿ [4] **وانه كان يقول سفيهنا على الله شططا**﴾ وە بەڕاستی هەرزەکەمان (ئیبلیس) قسەی ناپەسەند و نابەجێی دەربارەی خوا دەکرد: بە وەسفکردنی شەریك و هەبوونی ژن و منداڵی هەیە! ﴿ [5] **وانا ظننا أن لن تقول الإنس والجن على الله كذبا**﴾ وەئێمە یەقینمان بوو کە هەرگیز دەستەی ئادەمیی و، جنیی درۆ لە بۆ خوا هەڵنابەسن.. کەچی کاتێ قورئانمان

بیست زانیمان زیادە ڕەوی زۆریانکردووە ﴿٦ وانه كان رجال من الإنس يعوذون برجال من الجن﴾ بێگومان پیاوگەلێك لەئادەمیی پەنایان دەبرد بەپیاوانی لەجینیان، لە سەفەریاندا بەشەو تا لەوشتانەی کەمەترسییان هەبوو بیانپارێزن.؟! ﴿فزادوهم رهقا﴾ جا جینیەکانیش ئەوەیان قۆزتەوەو زیاتر گومڕاوو سەر لێشێواوو ماندوویانکردن.

(ئەبوو سەعوود) ئەڵێ: ئەگەر پیاوێك ڕێی کەوتبا جێگایەکی چۆڵەوانیەوەو شەوی بەسەردا هاتباو ترسی لێ نیشتبا

لەپێش ئیسلامدا هەرکاتێ عەرەبەکان لە دۆڵ وشیوێکدا شەویان بەسەرا بهاتایە, زۆر ئەترسان لە جنۆکەی ئەو دۆڵ وشیوە، ئینجا پەنایان دەبردە بەر گەورەکەیان تا پەنایان بدات لە زیانی جنۆکەی ئەو ناوەیە، وە ئەیانگوت: (أعوذ بسيد هذا الوادی من سفهاء قومه)! پەنا دەبەمە بەرسەرۆکی جنۆکەی ئەم دۆڵ وشیوە، تانەفامەکانی ئازارم نەدەن.

وە یان ئەگەر نەخۆش بکەوتنایە نووشتەیان ئەکرد بەخۆیانا، یان پارچەدارێك، یان پەڕۆی سەرگۆڕێکیان هەڵ ئەگرت.... وە یان زۆر کەس لەمرۆڤەکان پەنایان ئەبردە بەر چەند مرۆڤێکی تر (وەك جوکیی و، جا دوگەرو، فالْچیی.. وە داوای نوشتەی دێوە بەندیان لێ ئەکردن تا بیانپارێزن لەزیانی جنۆکە.. ئینجا ئەوانە بۆ گەرمکردنی بازاڕی خۆیان ئەوەندەی تر ئەیانترساندن لە دێوو جنۆکە ﴿٧ وانهم ظنوا كما ظننتم ان لن يبعث الله احدا﴾ وە بەڕاستی ئەوانیش گومانیان وابوو وەك ئێوە گومانتان وابوو کە ئیترخوا هیچ کەسێك زیندوو ناکاتەوە دوای مردن, یان هیچ پێغەمبەرێك نانێرێ, وا ئێستا حاڵی بووین و ئەزانین کە خوا مردوان زیندوو دەکاتەوەوپێغەمبەریش دەنێرێ ﴿٨ وانا لمسنا السماء﴾ وەبەڕاستی ئێمە بەرەو ئاسمان کشاین بۆ زانینی هەواڵ و، دەنگ و باس ﴿فوجدناها ملئت حرسا شديدا وشهبا﴾ جابینیمان پڕە لە پاسەوانی بەهێزو پریشکی ئاگری سوتێنەر.

مامۆستا (شیخ موحەممەدی خاڵ) دەڵێت: دەبێ ئەو پاسەوانانە غەیری (شهب) بن و لە ئاسمانیشدا بن، واتە: لەو بۆشایەدا بن کە لە دەوری زەویدایە. جا ئەم پاسەوانانە بەهەر مادەیەکا - لە ئاسمانەوە بێت - هەڵ تەقین، خێرا لەناوی دەبەن، لەوەیش ئەچێ کەهەر پارچە ئەستێرەیەك لە بۆشایی دەرەوەی ئاسمانەوە بێت و ڕوو بکاتە سەر زەوی خێرا جۆرە (پرۆتۆنێکی سارد) پیا هەڵ ئەتەقێ و ئەیسوتێنێ و نایەڵێ بگاتە زەویی, مەبەست لە (شهب)یش ئەو پارچە ئەستێرانەن —خوایش چاکتر ئەزانێ- کە لەگەڵ زەویدا بەدەوری ڕۆژا ئەسوڕێنەوە، وەلەبەر بچووکی خۆیان بەئاسمانەوە نابینرێن، وە بەملیۆن و بلیۆن لەکۆمەڵەی ڕۆژی ئێمەدا بڵاو بوونەتەوە، وە لەشوێن خۆیان ئەترازێن و ڕووەو زەویی ئەکشێن. ﴿٩ وانا كنا نقعد منها مقاعد للسمع﴾ وە بەڕاستیی ئێمە پێش هاتنی قورئان لەهەندێ جێگای ئاسماندا دادەنیشتین بۆ گوێگرتن لە هەواڵ و ئەخباری فریشتەکان ﴿فمن يستمع الآن يجد له شهابا رصدا﴾ جا ئێستائەوەمان بیەوێت گوێ بگرێ بۆ وەرگرتنی ئەو هەواڵ و وتوو وێژەیە, یەکسەر نەیزەکێکی ئەستێرە لەکەمینایەو بۆی دەهاوێژرێت. ﴿١٠ وانا لا ندری اشر اريد بمن فی الأرض﴾ وەبەڕاستیی ئێمە دەمانزانی ئایا خوا ویستی زیانی بووە بە خەڵکیسەر زەویی بە حیراسەتی ئاسمان لە گوێگرتن بۆ هەواڵەکانی ﴿ام اراد بهم ربهم رشدا﴾ یاخود پەروەردگاریان ویستی خێرو چاکەی بووە پێیان؟! ﴿١١ وانا منا الصالحون ومنا دون ذلك﴾ وە بەڕاستی ئێمە کەسانی چاك و باشمان تیا هەن، وە لە خوار چاکانەوەشمان تێدا هەن ﴿كنا طرائق قددا﴾، ئێمە جاران ڕێبازگەلێکمان گرتبووە بەر, واتە: هەر دەستەیەکمان لەسەر ڕێگە و ڕێبازێك بووین و کەس خەتی کەسی نەئەخوێندەوەو هیچ کەسێك گوێی بۆ ئەوی تر نەدەگرت، تا ئیسلام هات، ئیتر پاش ئەوە وائێستە لەهەولی

یەکگرتندایین. ﴿١٢ وانا ظننا أن لن نعجز الله فی الأرض﴾ وە ئێمە ئەمانزانی کەقەت ناتوانین لە ژێر دەسەڵاتی خوادا دەرچین لەزەویدا ﴿ولن نعجزه هربا﴾ و ناتوانین بەهەڵاتن لەدەستی هەڵبێین.. بەڵام بەداخەوە سوودمان وەر نەگرت لەو زانینە، جا تکایە ئێوە وەك ئێمە مەبن ﴿١٣ وانا لما سمعنا الهدی آمنا به﴾ وە کە ئێمە کاتێ گوێمان لە ڕێنمایی (قورئان) بوو، یەکسەر بڕوامان پێکردو وەك ئێوە نەبووین ﴿فمن یؤمن بربه فلا یخاف بخسا ولا رهقا﴾ ئینجا ئەوەی ئیمان بێنێت بە پەروەردگاری خۆی , ئیتر لە لێکەمکردنی چاکەکانی ناترسێت , لەوە ستەم وغەدری لێبکرێ، چونکە خوا زۆر دادگەرە، ستەم لەهیچ کەسێك ناکات. ﴿١٤ وانامناالمسلمون ومنا القاسطون﴾ وە بێگومان لە ناو ئێمەدا پاش بیستنی قورئان کەسانی موسڵمان هەیە، وە کەسانی لە ڕێ لادەریشمان تێدایە, واتە: وەك ئێوە بووینە دوویەش، بڕوادارو، بێ بڕوا ﴿فمن أسلم فأولئك تحروا رشدا﴾ جا ئەوکەسەی بڕوای هێناو ملکەچبوو، دیارە ئەوانە ڕێی ڕاستیان گرتووە و بەختیارو سەرفرازن ﴿١٥ واما القاسطون فکانوا لجهنم حطبا﴾ بەڵام خوانەناس و ستەمکاران (ئەوانەمان بڕوایان نەهێنا) دەبنە دەسە چیلکەی دۆزەخ. جا لێرەدا وت و وێژی جنیەکان تەواو دەبێت. ﴿١٦ وان لو استقاموا علی الطریقة﴾ وە بەڕاستی ئەگەر ئەو خەڵکە (ئادەمیی و جن) ڕێی ئیسلامیان ڕاست گرتبا ﴿لأسقیناهم ماء غدقا﴾ ئەو حەلە ئاوێکی زۆرمان پێدەنۆشین و پیت ئەکەوتە مەزراو باخ و بێستانەکانیانەوە.

بەڵێ بڕواهێنان مرۆڤ هەڵ ئەنێت بۆ وریا بوونەوەو تێکۆشان و ئاوەدانکردنەوەی سەر زەویی، خواش پیرۆزیان ئەکا، وەك ئەفەرموێ: (ولو أن أهل القری آمنوا واتقوا لفتحنا علیهم برکات من السماء والأرض..)الأعراف/٩٦. ﴿١٧ لنفتنهم فیه﴾ تا تاقییان بکەینەوە پێی ئاخۆسوپاسگوزارن دەبن ,یا سوپڵەو بەد کار..؟.. بەڵێ.. دەوڵەمەندیی، دەستداریی، جوانیی، دەنگ خۆشیی، هێزو توانایی.. ناوو شۆرەت.. ئەمانە هەموو هۆی تاقیکردنەوەن لای خوای گەورە ﴿ومن یعرض عن ذکر ربه﴾ وە ئەوەی لەیادی پەروەردگاری خۆی, واتە: لە قورئان ڕوو وەرگێڕێ ﴿یسلکه عذابا صعدا﴾ خوا دەیخاتە ناوسزایەکی سەختەوە.. بەڵێ هەر قەوم و گەلێك لەڕێگای خوا لایداو ڕووی کردە کەیف و خۆشی و، ڕابواردن ئەوە بەرەبەرە خوا لەناوی ئەبات، ئەگەرچی ئێستایش وادیار نەبێت.

**مزگەوتەکان ماڵی خوان، بێ لەخواش هاوار لە کەس مەکەن:**

﴿١٨ وان المساجد لله فلا تدعوا مع الله احدا﴾ وە خوا وەحی بۆکردوم کە بەڕاستی مزگەوتەکان تایبەتی خوان، جالەگەڵ خوادا هاوارو هانا بۆ کەسی تر مەبەن، واتە: هەر خوا بپەرستن تیایانداو، وێنەو نیگاری بتانی تیا هەڵمەواسن و، هاواریش تەنها لەو بکەن ﴿١٩ وانه لما قام عبدالله یدعوه﴾ وە کاتێ بەندەی خوا (موحەممەد) ﷺ بۆ

سُورَةُ الجِنِّ — الجزء التاسع والعشرون

وَأَنَّا مِنَّا ٱلْمُسْلِمُونَ وَمِنَّا ٱلْقَٰسِطُونَ ۖ فَمَنْ أَسْلَمَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ تَحَرَّوْا۟ رَشَدًا ﴿١٤﴾ وَأَمَّا ٱلْقَٰسِطُونَ فَكَانُوا۟ لِجَهَنَّمَ حَطَبًا ﴿١٥﴾ وَأَلَّوِ ٱسْتَقَٰمُوا۟ عَلَى ٱلطَّرِيقَةِ لَأَسْقَيْنَٰهُم مَّآءً غَدَقًا ﴿١٦﴾ لِّنَفْتِنَهُمْ فِيهِ ۚ وَمَن يُعْرِضْ عَن ذِكْرِ رَبِّهِۦ يَسْلُكْهُ عَذَابًا صَعَدًا ﴿١٧﴾ وَأَنَّ ٱلْمَسَٰجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُوا۟ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدًا ﴿١٨﴾ وَأَنَّهُۥ لَمَّا قَامَ عَبْدُ ٱللَّهِ يَدْعُوهُ كَادُوا۟ يَكُونُونَ عَلَيْهِ لِبَدًا ﴿١٩﴾ قُلْ إِنَّمَآ أَدْعُوا۟ رَبِّى وَلَآ أُشْرِكُ بِهِۦٓ أَحَدًا ﴿٢٠﴾ قُلْ إِنِّى لَآ أَمْلِكُ لَكُمْ ضَرًّا وَلَا رَشَدًا ﴿٢١﴾ قُلْ إِنِّى لَن يُجِيرَنِى مِنَ ٱللَّهِ أَحَدٌ وَلَنْ أَجِدَ مِن دُونِهِۦ مُلْتَحَدًا ﴿٢٢﴾ إِلَّا بَلَٰغًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِسَٰلَٰتِهِۦ ۚ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَإِنَّ لَهُۥ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ﴿٢٣﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا رَأَوْا۟ مَا يُوعَدُونَ فَسَيَعْلَمُونَ مَنْ أَضْعَفُ نَاصِرًا وَأَقَلُّ عَدَدًا ﴿٢٤﴾ قُلْ إِنْ أَدْرِىٓ أَقَرِيبٌ مَّا تُوعَدُونَ أَمْ يَجْعَلُ لَهُۥ رَبِّىٓ أَمَدًا ﴿٢٥﴾ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ فَلَا يُظْهِرُ عَلَىٰ غَيْبِهِۦٓ أَحَدًا ﴿٢٦﴾ إِلَّا مَنِ ٱرْتَضَىٰ مِن رَّسُولٍ فَإِنَّهُۥ يَسْلُكُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِۦ رَصَدًا ﴿٢٧﴾ لِّيَعْلَمَ أَن قَدْ أَبْلَغُوا۟ رِسَٰلَٰتِ رَبِّهِمْ وَأَحَاطَ بِمَا لَدَيْهِمْ وَأَحْصَىٰ كُلَّ شَىْءٍ عَدَدًۢا ﴿٢٨﴾

٥٧٢

خواپەرستیی هەڵساوهەر خوای دەپەرست لە نوێژەکەیدا ﴿كادوا يكونون عليه لبدا﴾ جنیەکان خەریك بوو دابارنە سەری لەبەر سوور بوونیان لەسەر بیستنی قورئان (وەك ئیبن عەباس دەڵێت). ﴿٢٠ قل إنما ادعوا ربی﴾ بە بتپەرستەکان بڵێ: من هەر پەروەردگاری خۆم دەپەرستم ﴿ولا اشرك به أحدا﴾ وکەسیش ناکەمە شەریك و هاوبەشی (نە ئادەمیی، نەبت). ﴿٢١ قل إنی لا أملك لكم ضرا ولا رشدا﴾ وەپێیان بڵێ: ئەی پێغەمبەر! ﷺ بەڕاستی من هیچ جۆرە زیان و قازانجێکم بەدەست نیە بۆتان ,بەڵکو زیان و قازانج هەر بەدەستی خوایە. ﴿٢٢ قل إنی لن يجيرنی من الله أحد﴾ پێیان بڵێ: بەڕاستی هیچ کەسێك نیە پەنام بدات لەئاستی سزای خوادا، ئەگەر سەرپێچی بکەم ﴿ولن اجد من دونه ملتحدا﴾ وە بێ لەویش هیچ پەناگەیەك نیە هەڵبێم بۆی , واتە:یاریدەدەرو پشتیوانێك شك نابەم تا پەنام بدات، ئیتر چۆن بێمە سەر قسەی ئێوە؟! ﴿٢٣ إلا بلاغا من الله ورسالاته﴾ هیچ شتێکم بەدەست نیە بۆتان ,جگە لە بەلاغێك لە خواوەو لە پەیامەکانیەوە، کەوابوو دەبێ پەیامەکەی خوا بەڕێك و پێکی رابگەیەنم , ئەگینە خوا سزام ئەدات ﴿ومن يعص الله ورسوله﴾ و ئەوەی لەفەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی سەرپێچی بکا بە لادان لە تەوحیدو شەریعەتی خوا ﴿فإن له نار جهنم خالدين فيها أبدا﴾ جا بێگومان ئەوە ئاگری دۆزەخی بۆ ئامادە کراوە، بەهەتا هەتایی و هەمیشەیی تێیدا دەمێنێتەوە.. ﴿٢٤ حتى إذا رأوا مايوعدون﴾ تا کاتێ هەڕەشەو ئەوسزایەیان بینی کە هەڕەشەیان پی لێدەکرێت لەلایەن خواوە ﴿فسيعلمون من اضعف ناصرا واقل عددا﴾ ئەو دەمە ئیتر ئەزانن چ کەسێ هاوکاری و پشتیوانی لاوازترەو ژمارەی لەشکرو سوپای کەمترە ,هیچ گومان نییە کە خوا یارمەتیدەری موسڵمانانە، کەوابوو موسڵمانەکان یارمەتی دەریان بەهێزترەو ژمارەیان زیاترە، چونکە خواو فریشتەکانیشیان لەگەڵە.

## پێغەمبەریش نازانێ قیامەت کەی دێ:

﴿٢٥ قل إن ادری اقريب ما توعدون﴾ پێیان بڵێ: من نازانم ئایا ئەوەیهەڕەشەتان پێ لێدەکرێ لەلایەن پەروەردگارتانەوە نزیکە بێتە سەرتان بەهاتنی رۆژی قیامەت ﴿أم يجعل له ربی أمدا﴾ یا خواوەندم ماوەیەکی بۆ دادەنێ؟ ئیتر ئێوە بۆ گاڵتە ئەکەن و بەسووك تەماشای رووداوەکانی رۆژی دوایی ئەکەن ﴿٢٦ عالم الغيب فلا يظهر على غيبه أحدا﴾ ئەو زاتە زانای نادیارو غەیبە , غەیبی خۆی بۆ هیچ کەسێك دەرناخاو ئاشکرا ناکا ﴿٢٧ إلا من ارتضى من رسول﴾ مەگەر بۆپەیامبەرێك کە خۆی لێی رازی بێت , ئەوجەلە ئاگاداری هەندێ لەنهێنیەکانی خۆی دەکات, کەوابوو غەیب زانین، تایبەتە تەنها بەزاتی پەروەردگارمانەوە (جل جلاله) ئیتر هیچ کەسێك پەی پێ نابات، مەگەر کەسێکی خاوەن خووی جوان و شیرین و ڕاساڵ و ملکەچ بۆ فەرمانەکانی خوا لەپەیامبەران، وەك (عیسا)ی کوڕی (مەریەم) ئەوەبوو ئوممەت و گەلەکەی خۆی بەگەڵێ شت -کە ئەوان نەیان ئەزانی- ئاگادار کرد: (وانبئكم بما تأكلون وما تدخرون فی بیوتکم..) ٤٩/٣.. ﴿فإنه يسلك من بين يديه ومن خلفه رصدا﴾جا بێگومان ئەوکاتە پەروەردگارت فریشتە دەکاتە پاسەوانی لەپێش و لە پشتیەوە بۆپاراستنی لەدەستی شیاتین ودزینی بۆ جووکیەکان ﴿٢٨ ليعلم ان قد أبلغوا رسالات ربهم﴾ بۆ ئەوەی بزانێ و ئاگادار بێت کە بەڕاستیی پێغەمبەران بەڕێك و پێکی پەیامەکانی پەوردگاری خۆیانیان ڕاگەیاندووە ,بەو شێوەیەی کە بۆیان سروشتکراوە بێ زیادو کەم، واتە: خوای پەروەردگار چاودێری پەیامبەرانی خۆی دەکات، بەفریشتە تا بەئاسانی پەیامەکەیان بگەیەنن. ﴿واحاط بما لديهم﴾ وەخوا بەهەموو شتێکیشان دەزانێ و بەئاگایەو هیچ شتێکی لا بزر نابێ ﴿واحصى كل شئ عددا﴾ وهەموو

شتێكیشی بەورد ئەژماردووە هەرچی لەزەویی و، لەئاسمانداییەو دڵۆپە دڵۆپی باران و، لم و زیخ و بەردە وردەو گەڵای داران و كەفی سەر دەریاچەكان.

**بەكورتیی:** هیچ شتێكی لا نادیار نییە ئیتر چۆن ئاگاداری ئەو وەحیی و سروشە نییە بۆپەیامبەرانی ئەنێریٚ، تائەوان بتوانن درێغی و كەمتەرخەمی تیابكەن؟.

زۆر زۆر سوپاس بۆ خوای جوانكار و دلۆڤان كە یارمەتیدام بۆ تەواوكردنی تەفسیری سوورەتی (جن).

*** *** ***

## ٧٣- سوورەتی (موززەممیل)ـە
## مەككەییيەو (٢٠) ئایەتە

### بەناوی خوای دەهندەو میهرەبان

سوورەتی (موززەممیل) پاش سوورەتی (قەڵەم) هاتووە، كورتە باسێكی ژیانی پێغەمبەر ﷺ باس ئەكات، بەتایبەت خۆ یەكلا كردنەوەیی و، شەو نوێژەكانی و، قورئان خوێندنەكەی، دەشتوانی بڵێیت: تەوەرەكەی سەرجەم هەر باسی پەیامبەرە ﷺ، هەر بۆیەش پێی دەڵێن: سوورەتی (المزمل). پەیامبەر ﷺ ئەو كاتە كە لە ئەشكەوتی (حراء)دا خەریكی خواناسین بوو، جبریل هات و یەكەم وەحی و سروشی بۆ هێنا، جا لە قورسی و گرانی ئەو ڕووداوە ترس و لەرزێكی زۆری لێ نیشت و دڵی زۆر بێ تاقەت بوو، باری سەرشانی زۆر گران بوو، بۆیە زۆر بەپەلە گەڕایەوە بۆ لای خاتوو (خەدیجە)و فەرمووی: ((زملوني، زملوني= داپۆشن داپۆشن)) بەڕاستیی ئەترسم تووشی شتێك ببوبم! لەوە ئەترسا كە لەئاییندەدا نەتوانێ وەك پێویست هەڵسێ بەئەنجامدانی ئەركەكانی سەرشانی خۆی، بۆیە ئاوا تووشی ئەو دڵتەنگی و نارەحەتییە بوو.. ئەگینە پەیامبەرێكی خۆشەویستی ئاوا هەرگیز ترسی ئەوەی نابێت و نایشترسێت كە دەستی لێ وەشێنرابێت. سوورەتەكە بەوشەیەكی زۆر ناسكپەروەرانەو پڕ لەسۆزو میهرەبانی لەلایەن پەروەردگارەوە دەست پێ ئەكات، وەك بیەوێ ماندوو نەبوونی لە پەیامبەر بكات ﷺ، بەتایبەت ئەو ماوەیەش زۆر خۆی ماندوو ئەكرد بە شەونوێژ، و قورئان دەوركردنەوەوە، لەبەر خۆشنوودی وە ڕەزایەتی خوای گەورە.. ئینجا باسی گەورەیی و مەزنیی و قورسیی وەحی (سروش)ی بۆ دەكات، تا بایەخێكی زۆری بداتێ، زۆر بەبێداریی و هۆشیارانە هەوڵی پیادەكردنی بدات. فەرمان ئەدات بەپێغەمبەر ﷺ كە لەبەرامبەر ئەشكەنجەی هاوبەش پەیداكەرانەوە دان بەخۆدا بگرێ: (واصبر علی مایقولون واهجرهم هجرا جمیلا..)، هەڕەشەیەكی زۆر قورس و سەخت یش لە هاوبەش پەیداكەران دەكات ودەیانترسێنێ بەسزای ڕۆژی دوایی، ئەو ڕۆژەی كەسەری منداڵانی تیا سپی ئەبێت. كۆتاییشی دێت بەسووك كردنی ئەرك و باری سەرشانیان، تا بتوانن لەپاڵ ئەوەشدا ژیان پەیدا بكەن.

### ئەی پێغەمبەر! شەو هەستە بۆ نوێژ:

﴿بسم الله الرحمن الرحیم * ١ یا أیها المزمل﴾ ئەی كاڵا لە باڵا پێچاو! ئەی ئەو كەسەی لەرزت لێ هاتووەو خۆتت داپۆشیوە! ئەی پێغەمبەرﷺ! ﴿٢ قم اللیل إلا قلیلا﴾ شەو هەستە واز لەخۆپێچانەوە بێنەو گوڕ بەخۆت بدە و نوێژ بكە مەگەر كەمەكێكی شەو نەبێ بۆ خەوو حەوانەوەت ﴿٣ نصفه أوانقص منه قلیلا﴾ ئەویش بەم شێوەیە: نیوەی (شەو) یا هەندێكی لێ كەم بكەوە. (ئەگەر شەوگار درێژ بوو). واتە: شەو نوێژەكەت هەمووكاتەكانی شەوگاری پێ مەگرەوە، چونكە ماندوو دەبیت، بەڵكو سێیەك باشە. ﴿٤ أوزد علیه﴾ یان زیاتری بكە. ئەگەر شەوگار

کورت بوو. واتە: بیکە بەسیٚبەشەوە، دووبەشیٚهەڵسە, لەوە زیاتر نەبیٚ، نەوەك بەهۆی ئەوەوە نەتوانی ئیش وکاری پەیامبەریەتی ببەی بەڕێوە، وەك لەسوورەتی (ئیسرا)دا ئەفەرمووێ: (ومن الليل فتهجد به نافلة لك عسى أن يبعثك ربك مقاما محمودا).٧٩/١٧. ﴿ ورتل القرآن ترتيلا﴾ زۆریش بەئاهستەو لەسەر خۆیی و ڕێك وپێك ئەم قورئانە بخوێنەو، دەوری بکەوە، بالەدڵتا جێگەی خۆی بکاتەوە، (ئیبن عەباس) دەڵێت: ئەم بڕیاری شەونوێژە لەسەر شانی پێغەمبەر ﷺ تەنها ساڵێکی خایاند و بەکۆتایی سوورەتەکە بڕایەوە، ئەوەیە کەزانایان ئەڵێن: کۆتایی سوورەتێك لەقورئان، سەرەتاییەکەی سڕییەوە. (لە بوخاریی)دا هاتووە: سەبارەت بەشێوەی قورئان خوێندنی پێغەمبەر ﷺ کە لە (ئەنەس) ئەپرسن: لەوەڵامدا ئەڵێ: قورئان خوێندنی پێغەمبەر ﷺ هەر شوێنیٚ پێویستی بە درێژ کردنەوە کردبا, درێژی دەکردەوە: بەم جۆرە کاتیٚ کە (بسم الله الرحمن الرحيم)ی دەخوێند. (بسم الله)ی درێژ دەکردەوە، (الرحمن)ی درێژ دەکردەوە، (الرحيم)یش هەروا. لە کۆتایی (بسم الله الرحمن الرحيم)دا ئەوەستا، لە کۆتایی (الحمد لله رب العالمين)دا هەروا، (الرحمن الرحيم)یش هەر بەو جۆرە. پێشەوا ئەحمەد ئەبوو داود ترمزی. وە لەڕۆژی سەلاوبەرێدا بەقورئان خوێن دەگوتریٚ: ((إقرأ وارق ورتل كما كنت ترتل في الدنيا فإن منزلتك عن آخر آية تقرؤها)). ئەحمەد، تیرمزی، نەسائی.


الجزء التاسع والعشرون — سورة المزمل

سُورَةُ المُزَّمِّل

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُزَّمِّلُ ١ قُمِ ٱلَّيْلَ إِلَّا قَلِيلًا ٢ نِّصْفَهُۥٓ أَوِ ٱنقُصْ مِنْهُ قَلِيلًا
٣ أَوْ زِدْ عَلَيْهِ وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا ٤ إِنَّا سَنُلْقِى عَلَيْكَ قَوْلًا
ثَقِيلًا ٥ إِنَّ نَاشِئَةَ ٱلَّيْلِ هِىَ أَشَدُّ وَطْـًٔا وَأَقْوَمُ قِيلًا ٦ إِنَّ لَكَ فِى
ٱلنَّهَارِ سَبْحًا طَوِيلًا ٧ وَٱذْكُرِ ٱسْمَ رَبِّكَ وَتَبَتَّلْ إِلَيْهِ تَبْتِيلًا ٨
رَّبُّ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱتَّخِذْهُ وَكِيلًا ٩ وَٱصْبِرْ
عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَٱهْجُرْهُمْ هَجْرًا جَمِيلًا ١٠ وَذَرْنِى وَٱلْمُكَذِّبِينَ
أُو۟لِى ٱلنَّعْمَةِ وَمَهِّلْهُمْ قَلِيلًا ١١ إِنَّ لَدَيْنَآ أَنكَالًا وَجَحِيمًا ١٢
وَطَعَامًا ذَا غُصَّةٍ وَعَذَابًا أَلِيمًا ١٣ يَوْمَ تَرْجُفُ ٱلْأَرْضُ وَٱلْجِبَالُ
وَكَانَتِ ٱلْجِبَالُ كَثِيبًا مَّهِيلًا ١٤ إِنَّآ أَرْسَلْنَآ إِلَيْكُمْ رَسُولًا شَٰهِدًا
عَلَيْكُمْ كَمَآ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ رَسُولًا ١٥ فَعَصَىٰ فِرْعَوْنُ ٱلرَّسُولَ
فَأَخَذْنَٰهُ أَخْذًا وَبِيلًا ١٦ فَكَيْفَ تَتَّقُونَ إِن كَفَرْتُمْ يَوْمًا يَجْعَلُ
ٱلْوِلْدَٰنَ شِيبًا ١٧ ٱلسَّمَآءُ مُنفَطِرٌۢ بِهِۦ كَانَ وَعْدُهُۥ مَفْعُولًا ١٨
إِنَّ هَٰذِهِۦ تَذْكِرَةٌ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا ١٩

إن ربك ٥٧٤

**گەورەو گرانی قورئان:**

﴿ ٥ إنا سنلقي عليك قولا ثقيلا﴾ بەڕاستی ئێمە فەرموودەو وتەیەکی قورس و سەنگینت پیٚ ڕادەگەیەنین ,بەڵیٚ بەڕاستی هەڵگرتن و ڕاگەیاندنی ئاییینی پیرۆزی ئیسلام بیٚ ئەمبەرو ئەوبەر, ئەرکێکی ئێجگار قورس و گرانە، مەگەر تەنها پەیامبەران بەچاکی تێگەیشت بن لەو سپاردە گەورەیە کە خوا لە بارەیدا ئەفەرمووێ: (إنا عرضنا الأمانة على السموات والأرض والجبال فأبين أن يحملنها وأشفقن منها وحملها الإنسان..)٧٢/٣٣.

**شەونوێژو بەخەبەربوون جێدارو لەبارترە:**

﴿ ٦ إن ناشئة الليل هي أشد وطئا﴾ بەڕاستی شەو بێداریی و گفت و گۆو پاڕانەوەو ڕازو نیاز لەگەڵ پەروەردگاردا زۆر کاریگەر ترە لەسەر شانی نوێژکار لەنوێژی ڕۆژ، چونکە شەو کاتی خەوو حەوانەوەیە.. پیاو حەق بڵێت شەو نوێژیش بۆمرۆڤ کارێکی زۆر گرنگە و، فێری شەونخوونی و وەخت و بێوەختی دەکات ﴿ وأقوم قيلا﴾ وە بۆ خوێندنی قورئانیش لەبارترە شەو بۆ دەورکردنەوەی قورئان زۆر گونجاوو ئاهستەیە، چونکە جیهان هەموو لەجم و جووڵ و بزوتن ئەکەوێتوو دڵ و دەروونەکان حەساونەتەوە، زیهن ودەروون لەخەتەرە پاك بۆتەوە
٧ ﴿ إن لك في النهار سبحا طويلا﴾ بەڕاستی بەڕۆژیشدا مەودای هات و چۆت درێژو فراوانە بەدەم ژیان وگوزەرانەوە

دەڕۆیت، جا کەوابوو بەشێکی شەو بۆ خواپەرستی دابنێ و، بەرۆژیشدا نان پەیدا بکەو کاروباری ئاینەکەت بەڕێ بکە ﴿^٨ واذكر اسم ربك وتبتل إليه تبتيلا﴾ تۆ با هەمیشە ناوی پەروەردگارت لەسەر زارت بێت , خۆ لەهەموو شتێ دابڕەو خۆت یەکلا بکەوە, بەتەواوی پشت لە هەموو شتێك بکەو تەنها ڕوو لە خوا بکە، لە غەیرەز ئەو زاتەی تۆ دەیپەرستی لەهەموو شتێك بتەکەوە ﴿^٩ رب المشرق والمغرب﴾ ئەو زاتەی تۆ دەیپەرستی پەروەردگاری خۆرهەڵات و خۆر ئاوایە ﴿لا إله إلا الله﴾ و بێجگە لەو هیچ پەرستراوێکی تربە هەق نیە ﴿فاتخذه وكيلا﴾ جا تۆش بەردەوام هەر ئەو بکە بەپارێزەرو پشتیوانی خۆت و کاروبارت دەستی ئەو بدە.

**بەرامبە بە قسەکانیان خۆراگربە:**

﴿^١٠ واصبر على مايقولون﴾ وە لەئاست ئەوەی ئەوان ئەیڵێن هەردەم خۆڕاگرو بەئارام بە ﴿واهجرهم هجرا جميلا﴾ وە بە شێوەیەکی جوانیش دەستیان لێ هەڵگرەو دووربە لێیان, واتە: هیچ جۆرە عەزیەتێکی تیا نەبێت ﴿^١١ وذرني والمكذبين أولى النعمة﴾ لێم گەڕێ بۆ ئەو خاوەن سامان و ماڵ نیعمەتانە کە بەرنامەی خوا بەدرۆ دەخەنەوە , تۆ تکایان بۆ مەکە با من تۆڵەیان لێ وەر گرم ﴿ومهلهم قليلا﴾ تۆ کەمێك مۆڵەتیان بدە با بەتەواوی بگەنە ڕۆژی خۆیان.. بەڵێ بەئارەزووی خۆیان رایان بوارد تا ئەوکاتە پێغەمبەر ﷺ گەیشتە مەدینە، جا ئەو دەمە بەجۆرەها نارەحەتی عەزیەت دران و، پاشان ناو دارەکانیان لە (بدر)دا کوژران! ﴿^١٢ إن لدينا انكالا وجحيما﴾ بەڕاستی ئێمە سزای دونیاییمان هەیەو لەپاشەرۆژیشدا کۆت و زنجیری سەنگین و ئاگری هەڵگیرساوی دۆزەخمان هەیە ﴿^١٣ وطعاما ذاغصة﴾ هەروەها خۆراکێك کە لە گەرو دەگیرێت لەبەری درەختی زەققوم، کە زۆر بەنائاسایی لە گەروویانەوە دەڕواتە خوارەوە ﴿وعذابا اليما﴾ سەرەڕای سزای سەخت و پڕئێش وئازار ﴿^١٤ يوم ترجف الأرض والجبال﴾ رۆژێك دێت کە زەوی و شاخەکان دێنە لەرزە ﴿وكانت الجبال كثيبا مهيلا﴾ و کێوەکانیش وەها وردئەبن، دەڵێیت تەپۆڵکەی لم وزیخە کەبەئاسانی تەخت دەبێت، پاش ئەوەی کەتابت ونەجووڵاو بوون.

**موحەممەدیش وەك مووسایە کەنێردرایە لای فیرعەون:**

ئینجا بەسزای دونیا ئەیانترسێنێ وەك ئەفەرموێ:﴿^١٥ إنا أرسلنا إليكم رسولا شاهدا عليكم﴾ خۆ بەڕاستیی ئێمە پەیامبەرێکمان (موحەممەد) ﷺ بۆ رەوانە کردوون، بۆتە شایەد بەسەرتانەوە کەهەرچیمان بەسەرا داوە پێی راگەیاندوون، ئێوە هیچ بروبیانووێکتان نەماوە ﴿كما أرسلنا إلى فرعون رسولا﴾ هەروەك چۆن بۆلای فیرعەونیش پەیامبەرێکمان (مووسا) ڕەوانە کرد، تاتێی بگەیەنێت ﴿^١٦ فعصى فرعون الرسول﴾ جا فیرعەون سەرپێچی کرد لەپەیامبەرەکەو لەفەرمانی دەرچوو و بڕوای نەهێناو داوای خوایەتی دەکرد..! ﴿فأخذناه أخذا وبيلا﴾ ئینجا ئێمەش زۆر بەتوندی پێچامانەوەو قارمان لێگرت، ئەوەبوو خۆی وتاقمەکەی لە دەریادا خنکان. جا ئێوەش ئەی قورەیش! بێدارو هۆشیار بن پێش ئەوەی قارتان لێبگرین.

**کەقیامەت هات چۆن قوتار دەبن؟**

﴿^١٧ فكيف تتقون إن كفرتم يوما﴾ جا ئەگەر ئێوە ئەی بێ بڕواکانی قورەیش!هەروا کافربن ئیتر چۆن خۆتان ئەپارێزن لە سزای رۆژێك ﴿يجعل الولدان شيبا﴾ کە ئەوەندە قورس و سەختە منداڵ پیر دەکا و کەس بەرگەی ناگرێ ﴿^١٨ السماء منفطر به﴾ ئاسمان بەهۆی سەختی ئەو رۆژەوە لەت و پەت ئەبێ ﴿كان وعده مفعولا﴾ ئەوە بەڵێنی خوایە, خۆ بەڵێنی خواش هەر دێتە دی ﴿^١٩ إن هذه تذكرة﴾ بێگومان ئەم سوورەتەش پەندو ئامۆژگارییەکە بۆ مەردم، بەشکو لەسەر لێشێواویی خۆیان بگەڕێنەوە ﴿فمن شاء اتخذ إلى ربه سبيلا﴾ بۆ ئەوکەسە بیەوێ ڕێگە بۆ

لای پەروەردگاری خۆی بگرێتە بەر. واتە: با ئەو جۆرە کەسانە هەوڵی کاری چاك و شیرین بدەن پێش هاتنی ئەو ڕۆژە.

**شەو نوێژ بە فەرزیی هەڵگیرا:**

﴿[٢٠] إن ربك يعلم انك تقوم ادنى من ثلثى الليل ونصفه وثلثه﴾ بێگومان پەروەردگارت چاك ئەزانێ کە تۆ ئەی پێغەمبەر! ﷺ نزیکەی دوو بەشی شەو، یان نیوەی، یان یەك سێوەمی هەڵدەسیت ﴿وطائفة من الذين معك﴾ هەروەها هەندێ لەوانەی کە لەگەڵتان هەڵدەستن بۆ شەونوێژ ئەو دەمەی کە (فەرز) کرابە سەرت ﴿والله يقدر الليل والنهار﴾ خوایش ئەندازەگیری شەوو ڕۆژی کردووە و ئەزانێ چوار وەرز چۆن بێ، کاتێ کورتە، کاتێ درێژە، چونکە مەردم یان زوو هەڵ ئەسێ و، زۆر ماندوو ئەبێ، یا درەنگ هەڵ ئەسێ و کاتەکەی لەکیس ئەچێ ﴿علم ان لن تحصوه﴾ چاکزانێ کە ئێوە قەت ناتوانن ئەندازەی ئەو شەوە ڕاگرن و بیژمێرن و لەکاتی خۆیدا هەڵسن بۆ شەو نوێژەکەتان ﴿فتاب عليكم﴾ جا لەبەر ئەوە ئێوەی بەخشیی و باریگرانی لەسەر سووککردن، ئەوانەتان کە نەیانتوانی بەو بەرنامەیە کار بکەن، وە یا قورئان بخوێنێ، بۆیە ئەفەرمووێ: ﴿فاقرءوا ماتيسر من القرآن﴾ جا چەندەتان بۆ لواو مەیسەر بوو –بێ دیاریکردنی کات– ئەوەندە شەو نوێژ بکەن ،نەك ئەو سێ یەك و نیوەو دوو بەشی شەوە، چونکە جگە لەو هۆیانەش: ﴿علم ان سيكون منكم مرضى﴾ خوای میهرەبان زانی لەئاییندەدا کەکەسێکتان لێ نەخۆش بکەوێ و نەتوانێ هەڵسێ بەشەو نوێژ. ﴿وآخرون يضربون فى الأرض يبتغون من فضل الله﴾ وەکەسانی تریش دەبن کە لەزەویدا دەگەڕێن بۆ بەدەست هێنانی بازرگانی و فەزڵی خوا بۆ ڕزق و ڕۆزی بچنە سەفەر بۆ ئەم وڵات و ئەو وڵات.. ﴿وآخرون يقاتلون فى سبيل الله﴾ وە کەسانی تر لە ئایندەدا جەنگ بکەن لەڕێی خوادا (بچن بۆ جیهادو ماندوو ببن) ﴿فاقرءوا ماتيسر منه﴾ جا کەوابوو هەرچەندتان بۆ لوا ئەوەندە قورئان بخوێنن و شەو نوێژ بکەن، چونکە خوای گەورە سۆزو میهرەبانی زۆرە لەگەڵ بەندەکانی خۆیدا، وە دیارە مەبەستێکی تایبەتی خۆی هەیە لەدانانی هەر جۆرە خواپەرستییەکدا، لێرەشدا هەر لەسەرەتاوە ویستی ئەو خەڵکە ڕابێنێ لەسەر شەو نخوونی و ئاگاداریی و هۆشیاریی، جاکە مەبەستەکەی جێبەجێ بوو بۆیان ئەگۆڕێ.

لەم ئایەتەوەیە (ئەبو حەنیفە) دەڵێت: خوێندنی سوورەتی (فاتیحە) لەنوێژدا واجیب نیە! بەڵگەیش ئەو فەرموودەیە کە هاتووە بەرامبەر کابرایە کە نوێژەکەیی بەناتەواو کردو، پاشان فەرمووی: ((ثم اقرأ ماتيسر معك من القرآن)) متفق عليه. جەماوەری زانایانیش بە فەرموودەی: ((لا صلاة لمن لم يقرأ بفاتحة الكتاب)) متفق عليه. یان فەرموودەی: ((لا تجزئ صلاة من لم يقرأ بأم القرآن)) (إبن خزيم)ە ڕەتی دەکەنەوە ﴿واقيموا الصلاة﴾ وە نوێژە

الجزء التاسع والعشرون — سُورَةُ المُزَّمِّلِ

۞ إِنَّ رَبَّكَ يَعْلَمُ أَنَّكَ تَقُومُ أَدْنَىٰ مِن ثُلُثَيِ ٱلَّيْلِ وَنِصْفَهُۥ وَثُلُثَهُۥ وَطَآئِفَةٌ مِّنَ ٱلَّذِينَ مَعَكَ ۚ وَٱللَّهُ يُقَدِّرُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ۚ عَلِمَ أَن لَّن تُحْصُوهُ فَتَابَ عَلَيْكُمْ ۖ فَٱقْرَءُوا۟ مَا تَيَسَّرَ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ ۚ عَلِمَ أَن سَيَكُونُ مِنكُم مَّرْضَىٰ ۙ وَءَاخَرُونَ يَضْرِبُونَ فِى ٱلْأَرْضِ يَبْتَغُونَ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ ۙ وَءَاخَرُونَ يُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ فَٱقْرَءُوا۟ مَا تَيَسَّرَ مِنْهُ ۚ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَقْرِضُوا۟ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا ۚ وَمَا تُقَدِّمُوا۟ لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِندَ ٱللَّهِ هُوَ خَيْرًا وَأَعْظَمَ أَجْرًا ۚ وَٱسْتَغْفِرُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌۢ ﴿٢٠﴾

سُورَةُ المُدَّثِّرِ — ترتيبها ٧٤ — آياتها ٥٦

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ ﴿١﴾ قُمْ فَأَنذِرْ ﴿٢﴾ وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ ﴿٣﴾ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ ﴿٤﴾ وَٱلرُّجْزَ فَٱهْجُرْ ﴿٥﴾ وَلَا تَمْنُن تَسْتَكْثِرُ ﴿٦﴾ وَلِرَبِّكَ فَٱصْبِرْ ﴿٧﴾ فَإِذَا نُقِرَ فِى ٱلنَّاقُورِ ﴿٨﴾ فَذَٰلِكَ يَوْمَئِذٍ يَوْمٌ عَسِيرٌ ﴿٩﴾ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ غَيْرُ يَسِيرٍ ﴿١٠﴾ ذَرْنِى وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيدًا ﴿١١﴾ وَجَعَلْتُ لَهُۥ مَالًا مَّمْدُودًا ﴿١٢﴾ وَبَنِينَ شُهُودًا ﴿١٣﴾ وَمَهَّدتُّ لَهُۥ تَمْهِيدًا ﴿١٤﴾ ثُمَّ يَطْمَعُ أَنْ أَزِيدَ ﴿١٥﴾ كَلَّآ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ لِءَايَٰتِنَا عَنِيدًا ﴿١٦﴾ سَأُرْهِقُهُۥ صَعُودًا ﴿١٧﴾

٥٧٥

فەرزەکانتان بەچاکی جێبەجێ بکەن بە بیرو هۆشەوە ﴿وآتوا الزكاة﴾ و زەکاتیش بدەن ﴿واقرضوا الله قرضا حسنا﴾ وە قەرزو (وام) بەشێوەیەکی جوان و چاك بەخوا بدەن (دەسگیرۆیی هەژاران بکەن بۆ ئەوەی سوودیان لێ وەرگرن) خواش پاداشێکی زۆرتان دەداتەوە. ﴿وما تقدموا لأنفسكم من خير تجدوه عند الله﴾ و هەر خێرو چاکەیەك پێش خۆتانی بخەن (پاداشتەکەی) لای خوا وەر ئەگرنەوە ﴿هو خيرا واعظم أجرا﴾ کە هەر ئەویش چاکترەو، پاداشی گەورەترە (لەوەی لای خۆتان ماوەتەوە). ﴿واستغفروا الله﴾ دەسائیتر ئێوەش داوای لێبوردن هەر لەخوا بکەن لە هەموو کاتدا ﴿إن الله غفور رحيم﴾ بەڕاستی خوا زۆر پۆشەرو لێبوردەو تاوان بەخشە، زۆریش دڵاوا میهرەبانە ((المؤمن القوى خير وأحب إلى الله من المؤمن الضعيف، وفى كل خير، أحرص على ماينفعك، وإستعن بالله، ولا تعجز وإن أصابك شئ فلا تقل: لو أنى فعلت كان كذا وكذا، ولكن قل: قدر الله ماشاء فعل، فإن (لو) تفتح عمل الشيطان)). رواه مسلم. واتە: موسڵمانی بەهێزو ماندوو ئیش کەر، چاکترو خۆشەویسترە لای خوا لەموسڵمانی لاواز و بێ هێزو ئیش نەکەرو خۆماندوو نەکەر، ئەگەرچی هەردوکیان خێرو چاکەیان لێدەوەشێتەوە، هەر شتێك سوودت پێبگەیەنێت هەر دەم سووربە بۆ وەدەست هێنانی، یارمەتی هەر لەخوا بخوازەو کۆڵ مەدە، خۆ ئەگەر نەهامەتیەکت تووش بوو، هەرگیز مەڵێ: ئەگەر (ئاوام) کردبا، ئاواو ئاوا دەبوو و (ئەم بەڵایەم تووش نەدەبوو)، بەڵکو هەر ئەمە بڵێ: بڕیاری خوا بوو و هەر شتێکی خواست هەر ئەوە دەبێت، چونکە وشەی (ئەگەر وام کردبا، وا دەبوو) دەروازەی کاری شەیتانت لێ دەکاتەوە.

زۆر سوپاس و پێزانین بۆ خوای باڵادەست کە یارمەتیدام بۆ تەواوکردنی تەفسیری سوورەتی (موززەمیل).

*** *** ***

## ٧٤/سوورەتی (موددەسسیر)ـە

## مەککەییەو (٥٦) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتی (موددەسسیر)یش وەك سوورەتی (موززەممیل) باسی چەند لایەنێکی کەسێتی پەیامبەری بەڕێز و سەروەر دەکات ﷺ، هەر بۆیەش بە (المدثر) ناو نراوە.

جا لەسەرەتاوە داوا لە پەیامبەر دەکات ﷺ کە هەستێ بە ئەنجامدانی ئەرکەکانی سەرشانی خۆی و هەستێ بەڕاگەیاندنی بانگەوازەکەی خوا، وە زۆر گرنگی و بایەخ بەو کارەیە بدا، بێ بڕوایانیش لەسزای سەختی پاشەڕۆژ بترسێنێ، خۆیشی لەبەرامبەر ئازاری قورەیشەوە.. ددان بەخۆدا بگرێ تا دوا بڕیاری خوا دێت, ئینجا بێ بڕوایان لەسزای قورسی رۆژی دوایی، ئەترسێنێ، بەشێوەیەك کە ئەوان هیچ حەوانەوەیەکی تیا نابینن.. پاشان باسی ئەو سەر سەختە کەللە رەقەیە (وەلیدی کوڕی موغیرە) دەکات، کە وەك (ئیبن عەباس) ئەڵێ: وەلید،گەلێ جار گوێی بۆ قورئان ئەگرت و دەیشیزانی کە فەرموودەی خوایە، بەڵام (کورسیی)ەکەی ژێری نەیهێشت خۆی بدات بەدەستەوە و بڕوابێنێ!! وەك ئیمامی (بوخاریی) دەڵێ: پاشان باسی ئەو ئاگرە بڵێسەدارە دەکات کە خوا بەڵێنی بەبێ بڕوایان و، سەرکارە دڵڕەقەکانی داوە.. سوێند بەمانگ و روناکییەکەی ئەخوات کە: دۆزەخ یەکێکە لەو بەڵاو نەهامەتیانەی کە یەخەی بێباوەڕان دەگرێ. تیشکێکیش ئەخاتە سەر گفت و گۆی نێوان موسڵمانان و تاوانباران، کاتێ لە هۆی چوونە ناو دۆزەخیان دەپرسن. کۆتاییشی بەکورتە باسێکی هۆی بڕوا نەهێنانی هاوبەش پەیدا کەران دێت.

**پاش سوورەتی (إقرأ) ئەم ئایەتانە هاتن:**

﴿بسم الله الرحمن الرحيم * ١ يا ايها المدثر﴾ ئەی ئەوەی جلکی خەوت بەخۆوە پێچاندووە! ئەی پێغەمبەر!ﷺ! ﴿٢ قم فأنذر﴾ هەستە، لە ناو نوێنەکەت خەڵکی بێباوەڕ بێدار بکەرەوەو بترسێنە لەسزای خوا. پێغەمبەر ﷺ لەئەشکەوتی (حیرا)دا بوو کاتێ کە وەحیی بۆ هات و بەئایەتی: (اقرأ باسم ربك الذي خلق...) دەستی پێکرد، جاچونکە هێشتای یەکەمجاری بوو جۆرە ترسێکی لێ نیشت و موچرکە ئەیگرت و بەدەم لەرزەوە بە پەلە هاتەوە بۆ ماڵەوەو فەرمووی: (دثرونی, دثرونی...) واتە:داپۆشن،داپۆشن, جا ئیتر پاش ئەوەی کە سەرەتای سوورەتی قەڵەمی بۆ هات.. دوو ساڵ و نیو سروش راگیراو نەهات، ئیتر پێغەمبەریش ﷺ حاڵەتە پێشووەکەی جارانی نەماو، دیسانەوە ئارەزووی وەحیی کردەوەو گەلێ بۆی بێ تاقەت بوو، جا ئیتر لەو ماوەیەدا فریشتەی سروش بەیناو بەین خۆی نیشان ئەداو، ئەمیش بەدەم لەرزەوە دەگەڕێتەوە ماڵەوەو دەفەرموێ داپۆشن. ئەم ماناو مەبەستە ئیمامی (بوخاریی و ئیمامی ئەحمەد) ریوایەتی دەکەن. ﴿٣ وربك فكبر﴾ وە پەروەردگاری خۆت بەگەورە بگرە، چونکە تەنها ئەو خاوەنی گەورەیی و (کبریا)یە، کەوابوو رووی دڵت هەر لەو بکە، ئیتر بێ بڕواکان بڕوا دێنن یان ناهێنن گرنگ نیە ﴿٤ وثيابك فطهر﴾ وە بەرگ و کاڵات، خاوێن بکەرەوە, واتە: دڵ و دەروونت، کارو کردارت هەمووی بەخاوێن رابگرە (چونکە موسڵمان دەبێ گرنگی بە دیوی دەرەوەو ناوەوەی بدات ﴿٥ والرجز فاهجر﴾ لە هەموو گوناح و جۆرە کارێکی ناپوخت و ناپەسەند گەڕێ. ئەم ئایەتانە مانایان ئەوە نییە کە خوا نەخواستە رۆژێ پەیامبەر ﷺ لەهێڵ لای دابێت. نەخێر. بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە ئوممەتەکەی تەمێ بێ و خۆیشی لەسەر رەوشتە بەرزەکانی بەردەوام بێت ﴿٦ ولا تمنن تستكثر﴾ وەشتێك مەبەخشە بۆ ئەوەی زۆرتر دەسکەوێت, واتە: منەت بەسەریانداو مەکە و، چاوەڕوانی زۆریان لێ مەکە ﴿٧ ولربك فاصبر﴾ و لە بەر رەزامەندی پەروەردگارت خۆگربە لەبەرامبەر ئازارو هەڕەشەی هۆزەکەتدا ﴿٨ فإذا نقر في الناقور﴾ ئینجا کاتێ فوو دەکرێ بەصووردا بۆ زیندوو بوونەوە. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: چۆن دڵم خۆش بێ و، بەخۆشی رابوێرم لەکاتێکدا خاوەن شەیپوورەکە (ئیسرافیل) دەمی بە (قەرن)ەکەوە ناوەو تەوێڵ و ناوچاوی نەویکردووە، چاوەنوارە کەیفەرمانی پێ بکەن، فووی پیا بکات، هاوەڵانی وتیان: جا لەو کاتەدا ئێمە چ بکەین و چ بڵێین؟! فەرمووی: بڵێن: ((حسبنا الله ونعم الوكيل، على الله توكلنا)) پێشەوائەحمەد. ﴿٩ فذلك يومئذ يوم عسير﴾ جا ئەو رۆژە، رۆژێکی زۆر گران و سەختە ﴿١٠ على الكافرين غير يسير﴾ لە سەر خوانەناس و بێ بڕوایان سووك و ئاسان نیە ,چونکە لێپرسینەوەو حیساب و لێکۆڵینەوە هەیە.

**خوا بەو کەسە دەڵێ قورئان جادووە:**

﴿١١ ذرني ومن خلقت وحيدا﴾ لە من و لەو کەسە گەڕێ دروستم کردووە بە تەنیا خۆی، واتە: تا لەسکی دایکیا بوو نەماڵ، نەمناڵ، نەهێز نە دەسەڵاتی هەبوو، کەچی ماڵ و کوڕیشم دایەو هەر بڕوای نەهێناوچوو بە گژ پەیامبەرەکەیشدا!. راڤەکەرانی قورئان دەڵێن: مەبەست بەو کەسە (وەلیدی کوڕی موغیرە)یە، خوا دەسەڵاتێکی زۆر چاکی دایە، کەچی لەباتی سوپاسگوزاریی یاخی بوو! وەك ئەفەرمووێ: ﴿١٢ وجعلت له مالا ممدودا﴾ ماڵ و داراییەکی زۆرم پێبەخشی (مەڕو ماڵات، باخ و بێستانی جوان و دڵگیر) ﴿١٣ وبنين شهودا﴾ وەکوڕانی هەمیشە ئامادەو بەردەست (لەگەڵیا، واتە: لە هەموو کاتێکی خۆشیی و ناخۆشییدا ئامادەبوون، ئەویش خۆی پێ هەڵ ئەکێشا ﴿١٤ ومهدت له تمهيدا﴾ وە دونیام بۆ راخستبوو بە راخستنێکی تەواو , واتە:بە ئارەزووی خۆی (دونیام

ڕشت بەسەریا) ﴿١٥ ثم يطمع ان ازيد﴾ پاشان ئەوەندە تەماعکارە هەر بەتەمایە بۆی زیاد بکەم.. (لەگەڵ ئەوەیشدا کە خوانەناس و بێ بڕوایە..!) ﴿١٦ كلا إنه كان لآياتنا عنيدا﴾ نەخێر ئەو چاو چنۆکە با بەتەما نەبێ، چونکە ئەو بەرامبەر بە ئایەتەکانمان هەر سەرکەش و سەر سەختە ﴿١٧ سأرهقه صعودا﴾ بە تەئکیدمنیش سزایەکی قورس و گران و سەخت بەسەریا ئەدەم (زۆر ماندوو هیلاکی دەکەم، بەناو بەرزایی کێوەکانی دۆزەخدا هەڵیدەگێڕم ﴿١٨ إنه فكر وقدر﴾ چونکە بەڕاستی بیری کردەوەو ئەندازەگیری کرد چی بڵێ دەر بارەی قورئان , بەڵام بەهەڵەدا چوو و ملکەچی حەق نەبوو! ﴿١٩ فقتل كيف قدر﴾ دە بەکوشتچێ (و خوا ریسوای بکات) چ جۆرە مەزەنەو ئەندازەیەکی گرت (ئەو نەفامە، پاش هەموو بیر کردنەوەیەکی ئەوجار دەڵێت: قورئان جادووە..!! ﴿٢٠ ثم قتل كيف قدر﴾ پاشان بەکوشتچێ، چۆن مەزەنەوئەندازەگیری کرد؟! ڕاڤەکەران دەڵێن: پێغەمبەرﷺ کاتێ کە نوێژی ئەکردو قورئانی ئەخوێندەوە (وەلید) بەلایا تێپەڕی و گوێی بۆ گرت و چاك چاك دڵی دایە، دواییش کە گەڕایەوە بۆ ناو هۆزو گەلەکەی وتی: ئێستا گوێم لە (موحەممەد)ەوە بوو قورئانی ئەخوێند.. سوێندم بەخوا ئەوە ئەو دەیخوێند نە وتەی ئادەمی بوو، نەوتەی جنیی بوو.. جا کاتێ ئەو قسەیە گەیشتەوە قورەیش، دەنگ و باس بڵاو بوویەوە کە وەلید چووەتە سەر ئایینی (موحەممەد)، ئەگەر ئەوە وابێت قورەیش هەموو شوێنی ئەکەون.. جا (ئەبووجەهل) ڕۆیشت بۆ لایی و وتی: دەڵێن دوای موحەممەد کەوتووی تا بەڵکو پاروە نانێکت بداتێ، ئەویش ڕقی هەڵساو وتی: جا موحەممەد نانی لە کوێ بوو، تا من بۆنان دوای ئەو بکەوم؟ خۆت چاك ئەزانی کە من مرۆڤێکی لات و هەژار نیم، پاشان وەلید وتی: باشە ئێوە پێتان وایە موحەممەد شێتە.؟ دە ئایا تا ئێستا بیستووتانە کاری شێتانە بکات..؟ لاتان وایە کە فاڵچی بێت.. بیستووتانە فاڵ بگرێتەوە..؟ پێتان وایە شاعیرە.. تا ئێستا هیچ شیعرێك بەدەمیا هاتووە..؟! پێتان وایە کابرایەکی درۆزنە، قەت درۆتان لەو بیستووە..؟! لەوەڵامی هەموو پرسیارەکاندا وتیان نەخێر. جا قوورەیش وتی: ئەی تۆ چۆن بیری لێ ئەکەیتەوەو هەڵی دەسەنگێنی..؟ وەلید وتی: جادووە! کوڕ لەباوك ئەکاو، باوك لەکوڕ.. بۆ ئەمەیە کە قورئان ئەفەرمووێ: (إنه فكر وقدر.. فقتل كيف قدر).. ﴿٢١ ثم نظر﴾ پاشان سەیری کرد چی بڵێ ﴿٢٢ ثم عبس وبسر﴾ لە پاشا ناو چاوانی هێنایەوە یەك و ڕووی گرژکرد ﴿٢٣ ثم ادبر واستكبر﴾ پاشان پشتی هەڵکرد لە ئیمان بە قورئان و خۆی بە زلزانی دوای پێغەمبەر کەوێ! وە لەباتی ئەوە کە قسەیەکی گونجاو بکات کەچی ﴿٢٤ فقال إن هذا الا سحر يؤثر﴾ جاوتی: ئەم قورئانە هەر جادووە لەخەڵکێکی ترەوە وەرئەگیرێ , واتە: محمد (لە بابیلی و، ئاشوریی و، میسریی و، هیندییەکانەوە)! ﴿٢٥ إن هذا إلا قول البشر﴾ ئەمە هەر قسەی مرۆڤە، لە قسەی خوا ناچێ! ﴿٢٦ سأصليه سقر﴾ لە

الجزء التاسع والعشرون — سورة المدثر

إِنَّهُۥ فَكَّرَ وَقَدَّرَ ﴿١٨﴾ فَقُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ ﴿١٩﴾ ثُمَّ قُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ ﴿٢٠﴾ ثُمَّ نَظَرَ
﴿٢١﴾ ثُمَّ عَبَسَ وَبَسَرَ ﴿٢٢﴾ ثُمَّ أَدْبَرَ وَٱسْتَكْبَرَ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ
يُؤْثَرُ ﴿٢٤﴾ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا قَوْلُ ٱلْبَشَرِ ﴿٢٥﴾ سَأُصْلِيهِ سَقَرَ ﴿٢٦﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ
مَا سَقَرُ ﴿٢٧﴾ لَا تُبْقِى وَلَا تَذَرُ ﴿٢٨﴾ لَوَّاحَةٌ لِّلْبَشَرِ ﴿٢٩﴾ عَلَيْهَا تِسْعَةَ عَشَرَ
﴿٣٠﴾ وَمَا جَعَلْنَآ أَصْحَٰبَ ٱلنَّارِ إِلَّا مَلَٰٓئِكَةً وَمَا جَعَلْنَا عِدَّتَهُمْ إِلَّا فِتْنَةً
لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِيَسْتَيْقِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ وَيَزْدَادَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِيمَٰنًا
وَلَا يَرْتَابَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَلِيَقُولَ ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ
وَٱلْكَٰفِرُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلًا كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى
مَن يَشَآءُ وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ وَمَا هِىَ إِلَّا ذِكْرَىٰ لِلْبَشَرِ ﴿٣١﴾ كَلَّا
وَٱلْقَمَرِ ﴿٣٢﴾ وَٱلَّيْلِ إِذْ أَدْبَرَ ﴿٣٣﴾ وَٱلصُّبْحِ إِذَآ أَسْفَرَ ﴿٣٤﴾ إِنَّهَا لَإِحْدَى
ٱلْكُبَرِ ﴿٣٥﴾ نَذِيرًا لِّلْبَشَرِ ﴿٣٦﴾ لِمَن شَآءَ مِنكُمْ أَن يَتَقَدَّمَ أَوْ يَتَأَخَّرَ ﴿٣٧﴾ كُلُّ
نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ ﴿٣٨﴾ إِلَّآ أَصْحَٰبَ ٱلْيَمِينِ ﴿٣٩﴾ فِى جَنَّٰتٍ يَتَسَآءَلُونَ
﴿٤٠﴾ عَنِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٤١﴾ مَا سَلَكَكُمْ فِى سَقَرَ ﴿٤٢﴾ قَالُوا۟ لَمْ نَكُ مِنَ
ٱلْمُصَلِّينَ ﴿٤٣﴾ وَلَمْ نَكُ نُطْعِمُ ٱلْمِسْكِينَ ﴿٤٤﴾ وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ
ٱلْخَآئِضِينَ ﴿٤٥﴾ وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿٤٦﴾ حَتَّىٰٓ أَتَىٰنَا ٱلْيَقِينُ ﴿٤٧﴾

٥٧٦ — فما لهم

مەوپاش ئەیخەمە ناو سەقەرەوە﴿ ٢٦ وما ادراك ما سقر﴾ جا تۆ چوزانی (سەقەر) چییە..؟ ئەگەر پێت نەڵێم ﴿ ٢٨ لا تبقى ولا تذر﴾ ئاگرێکە هیچ شتێك نایەڵێتەوە ئەیسووتێنێ لە گۆشت و ئێسقان و دەمارو وازیش ناهێنێت وجێناهێڵێت ﴿ ٢٩ لواحة للبشر﴾ پێستی سەرەوە و لاشە رەش ئەکاتەوە, واتە: بەهەرچی بگات ئەیسوتێنێ ﴿ ٣٠ علیها تسعة عشر﴾ نۆزدە فریشتەی بەسەرەوەن بۆ سەرپەرستیی و چاودێری و بەڕێوە بردنی دۆزەخ،

**ژمارەی فریشتەی سەرکاری ئاگر بۆ ئەزموینە :**

ئینجا خوا ئەفەرموێ:﴿ ٣١ وما جعلنا أصحاب النار إلا ملائكة﴾ وە هەر فریشەکانمان گێڕاوە بە خەزنەی دۆزەخ هەر لە فریشتە داناوە, کەوابوو کەس ناتوانێ ململانێیان لەگەڵ بکاو هەوڵ بدات خۆی لێیان دەرباز بکات وەك ئەبووجەهل دەڵێت ﴿ وما جعلنا عدتهم إلا فتنة للذين كفروا﴾ وژمارەیانمان نەگێڕاوە بە نۆزدە بۆ تاقیکردنەوەی بێ باوەڕان نەبێ، واتە: دەمانەوێ بەو هۆیەوە باوەڕ بێنن ﴿ ليستيقن الذين أوتوا الكتاب﴾ بۆ ئەوەش خاوەننامەکان بێگومان بن لە ڕاستی ئەم قورئانە ,چونکە ژمارەی ئەو فریشتانە لە کتێبەکانی ئەوانیشدا هەیە ﴿ ويزداد الذين ءامنوا إيمانا﴾ و بۆ ئەوەش بڕوادارەکان زیاتر بڕوایان دامەزرێت, کاتێ خاوەن نامەکان دەبینن بڕوایان هێنا بە ژمارەکان ﴿ ولا يرتاب الذين أوتوا الكتاب والمؤمنون﴾ وە ئیتر خاوەننامەو بڕوادارانیش گومانیان نەبێ لە حەقیقەتی دین وژمارەی فریشتەکان,دیارە ئەمە بۆ دووپاتکردنەوەی قسەی پێشووە، ئەگینە کاتێ کە بڕوا زیاتر بوو، ئیتردوو دڵی و گومان نامێنێ ﴿ ويقول الذين فى قلوبهم مرض والكافرون ماذا أراد الله بهذا مثلا﴾ وە بۆ ئەوەی دووروو و بێ بڕواکان بڵێن: خوا مەبەستی بەم ژمارەی نۆزدەیە چیە بەنموونە هێنایەوە؟﴿ كذلك يضل الله من يشاء ويهدى من يشاء﴾ وەك گومڕا کردنیکافرەکان ومونافقەکان خوا ئەوەی خۆی بیەوێ گومڕای دەکا وە هەر کەسیش خۆی بیەوێ هیدایەتی دەدا هەڵبەت هەر کەس خوا گومڕای بکا لە بەر نەشیاوی ئەو کەسە خۆیەتی وە هەر کەسیش خوا هیدایەتی بدات لە بەر شیاوی خۆیەتی ﴿ وما يعلم جنود ربك إلا هو﴾ وە جگە لەخوا خۆی کەسی تر بە ژمارەی لەشکرو سوپای پەروەردگار نازانێ, واتە: هەرئەو ئەزانێ ژمارەیان.. ئەوانەش وەنەبێ تەنها هەر ئەو نۆزدە بن بەڵکو بەهەزاران هەزارن. وەکو پێغەمبەر ﷺ لەشەوڕەوییەکەیدا لە وەسفی (بەیتول مەعمور) دا فەرمووی: ((فإذا هو يدخله فى كل يوم سبعون ألف ملك لا يعودون إليه آخر ما عليهم)) فتح الباري: ٣٤٨/٦. مسلم: ١٤٦/١. واتە: هەمو رۆژێك حەفتا هەزار فریشتە دەچنە نێوی، جارێکی تر ئەوانە ناگەڕێنەوە بۆی. ﴿ وماهى إلا ذكرى للبشر﴾ ئەو ئاگرەش هەر پەندو ئامۆژگارییە بۆ ئادەمزادە یاخییەکان، تا لێی بترسن و بڕوا بێنن و ڕاست و ڕاساڵ بن ﴿ ٣٢ كلا﴾ نەخێر،وانیە، رۆژێك دێت پەشیمان دەبنەوە ﴿ والقمر﴾ سوێند بە مانگ کە چەند شتێکی گرنگە ﴿ ٣٣ والليل إذا أدبر﴾ و سوێند بەشەو کاتێ تێدەپەڕێت ﴿ ٣٤ والصبح إذا أسفر﴾ و سوێند بە بەرەبەیان ودەمی بەیانیان, کاتێ وردە وردە بێ پەردە خۆی دەنوێنێت ﴿ ٣٥ إنها لإحدى الكبر﴾ بەڕاستنی ئەو (ئاگری دۆزەخ)ە، بەڵایەکە لەبەڵا هەرە گەورەکان ,جا ئیتر ئێوە چۆن گاڵتەی پێ ئەکەن؟ حەق وایە خۆتانی لێ بپارێزن ﴿ ٣٦ نذيرا للبشر﴾ بۆ بێدار کردنەوەو ترسێنەری سەرجەم ئادەمزاد ,تا لەهەموو خراپەیەك سڵ بکەنەوە ﴿ ٣٧ لمن شاء منكم أن يتقدم أو يتأخر﴾ بەتایبەت بۆ ئەو کەسەی بیەوێ پێشکەوێ و کێبەرکێ بکا لەکاری چاکەدا, یان خۆی دوا بخات لەکاری خراپەدا ﴿ ٣٨ كل نفس بما كسبت رهينة﴾ چونکە لە قیامەتدا هەموو کەسێك لە بارمتەو گرەوی کارو کردەوەی خۆیەتی ,ئیتر ئێستا کەیفی خۆیەتی، چاك ئەکات یا خراپ ﴿ ٣٩ إلا أصحاب اليمين﴾ یارانی دەستەی ڕاست نەبێ ,کە نامەکانیان بەدەستی ڕاستییانەوە ئەدرێ و، پارێزراویش ئەبن لەئاگر ﴿ ٤٠ فى جنات يتساءلون﴾

لەناو باخ و باخاتی بەهەشتدان و لەیەکتر پرسیار ئەکەن ﴿٤١ عن المجرمین﴾ سەبارەت بە تاوانکاران: ﴿٤٢ ماسلککم فی سقر﴾ و پێیان ئەڵێن: ئەوە چیبوو ئێوەی بەرەو دۆزەخ راپێچکرد؟ وا ئێستا ئەو سزا سەختە دەچێژن..؟ ﴿٤٣ قالوا﴾، ئەوانیش لەوەڵامدا ئەڵێن: یەکەم: ﴿لم نك من المصلین﴾ ئێمە لەنوێژ خوێنان نەبووین بۆ پەروەردگارمان، چونکە بڕوامان پێ نەبوو. دووەم: ﴿٤٤ ولم نك نطعم المسکین﴾ و خواردنمان بەبێ نەوایان نەئەداو دەستگرۆییمان نە ئەکردن. سێیەم: ﴿٤٥ وکنا نخوض مع الخائضین﴾ وە ئێمە هەمیشە سەرمان لە قسەی ناڕەوا دەنا لە گەڵ ئەوانەی سەریان لە قسەی ناڕەوا دەنا ﴿٤٦ وکنا نکذب بیوم الدین﴾ و بڕوامان بە ڕۆژی پاداش نەبوو بەدرۆمان دەزانی ﴿٤٧ حتی اتانا الیقین﴾ تا مەردن یەخەی پێگرتین و بەچاوی خۆمان دیمان، ئێمە هەرلەناو ئەو گومڕایی و سەر لێشێواوییەدا بووین ﴿٤٨ فما تنفعهم شفاعة الشافعین﴾ ئیتر تکای تکاکاران - ئەگەر بشبێت -کەڵکێ بەوان ناگەیەنێ، چونکە تکا وەك (ئیبن کەسیر) دەڵێت: بۆ ئەو کەسانە نابێ کە ئەو خوو و صیفەتە ناپەسەندانەیان هەبێ ﴿٤٩ فما لهم عن التذکرة معرضین﴾ جا چیانە وا لەپەندو ئامۆژگارییەکانی (قورئان) ڕوو وەردەچەرخێنن و هەڵدێن؟.

**کەلە قورئان هەڵدێن دەڵێی گوڕە خەرگەلن لە شێر هەڵدێن:**

﴿٥٠ کأنهم حمر مستنفرة﴾ هەر ئەڵێی کەرە کێوین ﴿٥١ فرت من قسورة﴾ کە لەدەستی شێر هەڵدێن و ڕەو ئەکەن و سڵ ئەکەن، دیارە کەرەکێوی کاتێ کە شێر ئەبینێ زۆر بەپەلە ڕەو دەکاو هەڵدێت.. هاوبەشدارنەرەکانیش کاتێ کە پێغەمبەرﷺ دەبینن وگوێیان لە قورئانەوە دەبێ، هەر ئاوا هەڵدێن و پشتی تێدەکەن ﴿٥٢ بل یرید کل إمرئ منهم ان یؤتی صحفا منشرة﴾ بەڵکو هەریەکەیان ئەیەوێ نامەیەکی کراوەی پێبدرێ وتیا بنوسرێ: لە خواوە بۆ فلانی کوڕی فلان وفەرمانی پێ بکرێ بە شوێنکەوتنی (محمد) جا بڕوای پێبکەن کە خوا بە پێغەمبەرێتی ناردوویەتی بۆیان!! کەواتە وازیان لێ بێنە با هەر لەو سەرلێشێواویەدا بسووڕێنەوە ﴿٥٣ کلا﴾ نەخێر، بەتەمای شتی وا نەبن ﴿٥٤ بل لا یخافون الآخرة﴾ چونکە ڕاستیەکەی هەر ئەوەیە کە لەپاشەرۆژ ناترسن ، هەر بۆیەش ئاوا تێکچوون ﴿کلا﴾ نەخێر، با ئەوەندە ڕۆ نەچن لە بێباوەڕییدا ﴿إنه تذکرة﴾ چونکە بەڕاستی ئەم (قورئان)ە یادخەرەوەی ڕاستیەکانە، جا هەر کەسێك ئارەزووی خۆیەتی بە گوێی ئەکات یانە؟ وەك ئەفەرموێ: ﴿٥٥ فمن شاء ذکره﴾ ئەوەی دەیەوێت -ئێستا ئازادە- با لەیادی بگرێت ﴿٥٦ وما یذکرون إلا ان یشاء الله﴾ خۆئەو خەڵکە ئامۆژگاری وەرناگرن، مەگەر ویستی خوای لەسەر بێت. واتە: توانای وەرگرتنی ئامۆژگاری نابێ، ئەگەر خوا نەیەوێ ﴿هو اهل التقوی﴾ هەر ئەویشە شیاوی لێ ترسانە ،چونکە خاوەنی تۆڵەی سەختە ﴿واهل المغفرة﴾ وە هەر ئەویشە شیاوی لێبوردنە لەتاوان، کەواتە تازووە وەرن تەوبە بکەن و پەشیمان ببنەوەو لەو کارە خراپانەتان.

والحمد لله أولا وآخرا، والصلاة والسلام علی محمد وآله وصحبه.

*** *** ***

## ٧٥- سووڕەتی (قیامەت) ە
## مەککەییەو (٤٠) ئایەتە

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

ئەم سووڕەتی (قیامەت)ە لە زیندووبوونەوەو پاداش و تۆڵە دەدوێ، بەڕاستیی باسێکی زۆر گرنگە و گەلێ لە مرۆڤەکان لێیان تێك چووە.. وە بەشێوەیەکی تایبەت باس لە ڕۆژی ڕەستاخێزو قۆناغە قورسەکانیدەکات..باسی ئەو ڕۆژە دەکات مرۆڤ بەمردن نزیك دەبێ و لەگیانەڵادایە، بۆ یەکەم جار سوێند دەخوات بەڕۆژی قیامەت و

بەنەفسی (لەووامە) و سەرزەنشتکار کە لەسەر هەموو کارێکی خراپ سەر کۆنەی خاوەنەکەی ئەکات.. سوێند ئەخوات بەوانە کە: زیندووبونەوە راستەو هیچ گومانێکی تیا نییە: (لا اقسم بیوم القیامة ولا اقسم بالنفس اللوامة...) ئینجا گەلێ لە نیشانەکانی هاتنی ئەو رۆژەیە باس ئەکات: وەك ئەوە کە چاو ئەبلەق ئەبێ و، مانگ تاریك ئەبێ و ئەگیرێ، خۆرو مانگ هەردوو کۆ ئەکرێنەوەو ئەبنە یەك پارچە و هەڵدەوەرێن و نامێنن.. لەتەفسیری قورتوبیدا هاتووە: (قیل: إن (لا)صلة، وجاز وقوعها في أول السورة لأن القرآن متصل بعضه ببعض، فهو في حكم كلام واحد... قال إبن عباس وإبن جبير وأبوعبيدة: معنى (لا اقسم)أى اقسم. وحكى أبو ليث السمرقندى: أجمع المفسرون أن معنى (لا اقسم): اقسم. واختلفوا في تفسير (لا) قال: بعضهم: (لا) رد لكلام منهم حيث انكروا البعث. وقال الفراء: وكان من لا يعرف هذه يقرأ (لأقسم) بغير ألف، كأنها لام تأكيد دخلت على اقسم وهو صواب، لأن العرب تقول: لأقسم بالله، وهى قراءة الحسن وإبن كثير وإبن الزهرى وإبن هرمز.

ئەوجا باسی گرنگی و بایەخدانی پەیامبەر ﷺ دەکات بەوەرگرتنی قورئان لە (جبریل)ـەوە.. (لا تحرك به لسانك لتعجل بە..) وە هەروەها ئادەمزاد دەکا بە دوو بەشەوە: بەختیارو سەر فراز، بەدبەخت و روو رەش.. (وجوه یومئذ باسرة..) ئەو رۆژە مرۆڤ لەگیانەڵادایەو گیان ئەگاتە قورقوراگەی و خزم و کەس و کاری لەدەوریاو دەستە ئەژنۆ دائەنیشن و هیچیان پێ ناکرێ بۆی، وە قاچ لەقاچ دەئالێ و، هێزی جوڵانەوەی لێ دەبرێ.. کۆتاییشی دێت بە هێنانی کۆمەڵێ بەڵگە بۆچەسپاندنی زیندووبوونەوە.. (أیحسب أن یترك سدی..)؟

سُورَةُ القِيَامَةِ — الجزء التاسع والعشرون

فَمَا تَنفَعُهُمْ شَفَٰعَةُ ٱلشَّٰفِعِينَ ﴿٤٨﴾ فَمَا لَهُمْ عَنِ ٱلتَّذْكِرَةِ مُعْرِضِينَ
﴿٤٩﴾ كَأَنَّهُمْ حُمُرٌ مُّسْتَنفِرَةٌ ﴿٥٠﴾ فَرَّتْ مِن قَسْوَرَةٍۭ ﴿٥١﴾ بَلْ يُرِيدُ
كُلُّ ٱمْرِئٍ مِّنْهُمْ أَن يُؤْتَىٰ صُحُفًا مُّنَشَّرَةً ﴿٥٢﴾ كَلَّا ۖ بَل لَّا يَخَافُونَ
ٱلْءَاخِرَةَ ﴿٥٣﴾ كَلَّآ إِنَّهُۥ تَذْكِرَةٌ ﴿٥٤﴾ فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ ﴿٥٥﴾
وَمَا يَذْكُرُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ۚ هُوَ أَهْلُ ٱلتَّقْوَىٰ وَأَهْلُ ٱلْمَغْفِرَةِ ﴿٥٦﴾

ترتيبها ٧٥ — سُورَةُ القِيَامَةِ — آياتها ٤٠

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

لَآ أُقْسِمُ بِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴿١﴾ وَلَآ أُقْسِمُ بِٱلنَّفْسِ ٱللَّوَّامَةِ ﴿٢﴾ أَيَحْسَبُ الحزب ٥٨
ٱلْإِنسَٰنُ أَلَّن نَّجْمَعَ عِظَامَهُۥ ﴿٣﴾ بَلَىٰ قَٰدِرِينَ عَلَىٰٓ أَن نُّسَوِّىَ بَنَانَهُۥ ﴿٤﴾ بَلْ
يُرِيدُ ٱلْإِنسَٰنُ لِيَفْجُرَ أَمَامَهُۥ ﴿٥﴾ يَسْـَٔلُ أَيَّانَ يَوْمُ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴿٦﴾ فَإِذَا بَرِقَ ٱلْبَصَرُ
﴿٧﴾ وَخَسَفَ ٱلْقَمَرُ ﴿٨﴾ وَجُمِعَ ٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ ﴿٩﴾ يَقُولُ ٱلْإِنسَٰنُ يَوْمَئِذٍ
أَيْنَ ٱلْمَفَرُّ ﴿١٠﴾ كَلَّا لَا وَزَرَ ﴿١١﴾ إِلَىٰ رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ ٱلْمُسْتَقَرُّ ﴿١٢﴾ يُنَبَّؤُا۟ ٱلْإِنسَٰنُ
يَوْمَئِذٍۭ بِمَا قَدَّمَ وَأَخَّرَ ﴿١٣﴾ بَلِ ٱلْإِنسَٰنُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ بَصِيرَةٌ ﴿١٤﴾ وَلَوْ أَلْقَىٰ
مَعَاذِيرَهُۥ ﴿١٥﴾ لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ﴿١٦﴾ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ
وَقُرْءَانَهُۥ ﴿١٧﴾ فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ ﴿١٨﴾ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُۥ ﴿١٩﴾

٥٧٧

**ئەمە سوێندی بێ قیامەت راستەو دێ:**

﴿بسم الله الرحمن الرحیم * [1] لا اقسم بیوم القیامة﴾ سوێند دەخۆم بەرۆژی رەستاخێز (رۆژی تۆڵەو پاداش) ﴿[2] ولا اقسم بالنفس اللوامة﴾ وە سوێند دەخۆم بە نەفسی سەر زەنشتکار،واتە: هەرکات بەلای کارێکی خراپدا رۆیشت بەپەلە سەر زەنشتی خۆی دەکاو دەگەڕێتەوە.. واتە:سوێند بەوانە هەموزیندوو دەکرێنەوە بۆپاداش و تۆڵە.

**دەشتوانین پێشەو سەرپەنجەکانی مرۆڤ ساز بکەینەوە:**

﴿[3] أیحسب الإنسان أن لن نجمع عظامه﴾ ئایا ئادەمیی پێی وایە کە هەرگیز ئێسکە (رزیوەکانی) پاش مردن کۆناکەینەوە؟! (عەدیی کوری رەبیعە) بەپێغەمبەری وت: ﷺ رۆژی قیامەت چۆنە؟ کەی دێت..؟ چۆن دەبێت..؟ پەیامبەر ﷺ بەدرێژی بۆی باسکردو، (عەدی)یش وتی: ئەگەر بەچاویش ببینم هەر بروات پێ ناکەم! وەگوتی: باشە ئاخر پێم ناڵێیت خوا ئەو ئێسکە رزیوانە چۆن کۆدەکاتەوە..؟ جا بۆ دووپاتکردنەوەی ئەو رووداوە ئەو ئایەتە

هاتە خوارەوە فەرمووی: ﴿ ٤ بلى قادرين على ان نسوى بنانه﴾ بەڵێ ئێمە بەتوانایین کە تەنانەت نەخشە و خەتی سەر پەنجەکانیشی وەکو خۆی ڕێك و پێك بکەینەوە ,بە هەموو نەخش و نهێنیەکانیەوە، لەکاتێکا نەخشەی سەرپەنجەی هیچ کەسێ لەهی کەسێکیتر ناچێ، دەتوانیت بۆ پتر وردەکاریی ئەو ڕاستیە سەرێك لەکتێبی: (وتەی زاناکان و باوەڕ بەخوا) بدەیت. ﴿ ٥ بل يريد الإنسان ليفجر أمامه﴾ بەڵکو مرۆڤی بێباوەڕ هەر ئەیەوێ بەردەوام بێ لە سەر ,خراپەکاری خۆی وەك ئاژەڵ بێ بەرنامە بسووڕێتەوە، بۆیە هەردەم کاری ناشیاو دەکاو، نکوولی زیندووبوونەوەش دەکات ﴿ ٦ يسأل ايان يوم القيامة﴾ بەلاقرتی و گاڵتەوە دەپرسێ: ڕۆژی قیامەت کەیە.. وەك بڵێ قیامەتی چی و لێپرسینەوەی چی؟! ﴿ ٧ فإذا برق البصر﴾ جاکاتێ ئەبڵەق بووچاو لەو ڕۆژەسەختەدا ئەبرسکێتەوەو لەبەر ترسی ئەو ڕۆژە مۆڵەق دەوەستێت ﴿ ٨ وخسف القمر﴾ هەیڤیش تاریك بوو ﴿ ٩ وجمع الشمس والقمر﴾ وخۆرو مانگ کۆ کرانەوە,واتە: هەڵوەرێنە خوارەوەو یاسای بوونەوەر تێکچوو ﴿ ١٠ يقول الإنسان يومئذ اين المفر﴾ لەو ڕۆژەدا ئادەمیی بێبڕوا دەڵێ: ئەی هاوار! بۆ کوێ ڕابکەم، ڕێگای هەڵاتن کوا؟ ﴿ ١١ كلا لا وزر﴾ نا، نا, ڕێگاو پەنای دەرباز بوون لە سزا نیە.. ﴿ ١٢ إلى ربك يومئذ المستقر﴾ لەو ڕۆژەدا قەرارگای بەندەکان (بەهەشت یا دۆزەخ) بۆ خواوەندی تۆیە, واتە: کەس ناتوانێ پەنای کەس بدات.

**قیامەت هات مرۆڤ هەرچی پێش خستبێ و جێمابێ هەواڵی پێدەدرێ:**

﴿ ١٣ ينبأ الإنسان يومئذ بما قدم واخر﴾ لەو ڕۆژەدا ئادەمیی هەواڵی هەموو پێدەدرێ بەوەی پێش خۆی خستووە لەکارو کردووەی چاك و خراپ، وەبەوەش بەجێی هێشتووە لە ئەسەرو شوێنەوارێك کاری پێدەکرا لە دوای مردنی ﴿ ١٤ بل الإنسان على نفسه بصيرة﴾ بەڵکوئەو ڕۆژە مرۆڤ لە سەرخۆی شایەتە چیکردووە, چیگوتووە؟.

تێبینی: (ت)ی بێژەی (بصيرة) لەم ئایەتەدا بۆ(موبالەغە)یە هەر وەکو چۆن لە (علامة)و (راوية)دا بۆ موبالەغەیە. ﴿ ١٥ ولو القى معاذيره﴾ هەرچەندە بەزمانیش بروو بیانوویەکی زۆر بێنێتەوە و پاکانە بکات بۆ ڕزگار کردنی خۆی، بەڵام بێ سوودەو کەڵکی نیە، چونکە خۆی شایەتە لەسەر خۆی.

**پێغەمبەر ﷺ لە جبریلەوە قورئانی وەرگرت:**

ئیمامی (بوخاریی) و (موسلیم) و جگە لەوانیش دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ زۆر سوورو بەهەوڵ بوو بۆ وەرگرتنی قورئان لەدەم جوبریلەوە، بۆیە پەلەی بۆوەگرتنی ئەکرد پێش ئەوەی جبریل لێ بێتەوە! تا خوای گەورە پێیفەرموو: ﴿ ١٦ لا تحرك به لسانك لتعجل به﴾ زمانت بەقورئان خوێندن مەجووڵێنە، واتە: پەلە مەکە بۆ لەبەر کردنی ﴿ ١٧ إن علينا جمعه وقرآنه﴾ بەڕاستی کۆکردنەوەو لەبەر کردنی و ئیسپاتی خوێندنەوەی لە سەر زمانت لەسەر ئێمەیە ﴿ ١٨ فإذا قرأناه فاتبع قرآنه﴾ جا کاتێ ئێمە لەڕێگەی (جوبریل)ەوە بۆت دەخوێنینەوە تۆ شوێنی خوێندنەوەکەی ئەو بکەوەو دوای ئەو بیڵێو پەیڕەوی لەو بکە ﴿ ١٩ ثم إن علينا بيانه﴾ لەپاش خوێندنەوەو لەبەر کردنیشی، ڕونکردنەوەی ماناکەیشی هەر لەسەر ئێمەیە. (ئیبن کەسیر) دەڵێ: پەیامبەر ﷺ بەشێوەیەك هەوڵی دەداو سوور بوو بۆ لەبەر کردنی قووڕئان، گەڵێ جار لە خوێندنەوەیدا پێش (جبريل) دەکەوت.. ئینجا خوای کارجوان فەرمانی پێکرد لەسەرخۆبێت و پەلە نەکات لەخوێندنەوەیدا،چونکە ئەو خۆی ماناو مەبەستەکەی بۆ ڕوون ئەکاتەوە.

**قیامەتی لا دوورە , چونکە دنیای خۆش دەوێ:**

﴿ ٢٠ كلا بل تحبون العاجلة * ٢١ وتذرون الآخرة﴾ نەخێر، وانیە.. وەك ئێوە پێتان وایە ئەی هاوبەشدانەران! گوایە زیندوو ناکرێنەوە..! بەڵکوبۆیە ئەو قسەیەدەکەن، ئێوە دونیاتان خۆش ئەوێ کەدنیاش بەپەلە کۆتایی دێ،

وەپاشە ڕۆژ واز لێ دەهێنن کە هەر نابڕێتەوە, واتە:هەموو هەوڵێکتان بۆ دونیایەو, بەتەواوی دوارۆژتان پشتگوێ خستووە، بۆیە ئا بەو شێوەیە بیر ئەکەنەوە.

**دیتنی خوا لە ڕۆژی پەسلآندا:**

﴿[٢٢] وجوه یومئذ ناضرة﴾ لەڕۆژی قیامەتدا دەم و چاوو روخسارگەلێ (واتە:ڕوومەتی باوەڕداران) گەشاوەو پاراوو پرشنگدارە وخۆشیی و شادییان لێ دەبینرێ ﴿[٢٣] إلی ربها ناظرة﴾ بۆپەروەردگاری خۆیان دەڕوانن.

جەماوەری زانایان– وەك لەچەندین فەرموودەی ڕەواو (صەحیح) وەرگیراوە– دەڵێن:مەبەست لەم ئایەتە ئەوەیە کە لەڕۆژی قیامەتدا بەندە صالحەکان تەماشای خوای خۆیان دەکەن و، بەچاوی خۆیان دەیبینن، وەك چۆن بەئارەزووی خۆیان تەماشای مانگە شەوی چواردە دەکەن و دەبینن. (ئیبن کەسیر) دەڵێ: رای کۆی هاوەڵان وشوێنکەوتوان (الصحابة والتابعون)یش هەر ئەمەیە، وە هەموو پێشەوایانی ئیسلام پاش ئەوانیش یەك دەنگن تێیدا. پێغەمبەر ﷺ بۆ پشتگیری لەو مەبەستە دەفەرمووێ: ((إنکم ترون ربکم کما ترون هذا القمر..))فتح الباری:٤٢٩/١٣ و مسلم: ٤٣٩/١. ودەفەرموێ: ((إذا دخل أهل الجنة الجنة، یقول الله تعالی: تریدون شیئا أزیدکم؟ فیقولون: ألم تبیض وجوهنا؟ ألم تدخلنا الجنة وتنجنامن النار؟ قال: فیکشف الحجاب، فما أعطوا شیئا أحب إلیهم من النظر الی ربهم، وهی الزیادة)) فی قوله تعالی: (للذین احسنوا الحسنی وزیادة)).موسلیم: ١٦٣/١. یان دەفەرمووێ: ((إن الله یتجلی للمؤمنین یضحك)).موسلیم ١٧٨/١.

**یاخییان ڕۆژی (قیامەت) ڕوو ڕەش دەبن:**

﴿[٢٤] ووجوه یومئذ باسرة﴾ وەروخسارانێکیش لەو ڕۆژەدای گرژن , واتە:و تاڵ و تاریك و دێزو ڕەشن ﴿[٢٥] تظن أن یفعل بها فاقرة﴾ هەریەکێکیان دەزانێ کە کردێکی مرۆغەی پشت دە شکێنێ ﴿[٢٦] کلا﴾ نەخێر، هەر ئاوا بۆیان ناچێتە سەر ﴿إذا بلغت التراقی﴾ کاتێ گیان گەیشتە قوڕقوڕاگە و مرۆڤ گەیشتە گیانەڵان و هیچ نوشتەو ئەفسانەیەك کەڵکی نەما ﴿[٢٧] وقیل من راق﴾ ئەو حەلە بەوەی لە دەورەیەتی گوترا: کێ چارە سەری دەکات؟ واتە: نائومێدبوون لە ژینی , هاوار دەبن بۆنووشتەیەك، پزیشکێك، دۆعایەك، بەڵکو شیفای بۆ بێت؟!.

سەرنجێك (قورتوبی) ئەڵێ: (واظهر عاصم النون فی قوله تعالی: (من راق)، واللام فی قوله "بل ران" لئلا یثبت مراق هو بائع المرقة، و(بران فی تثنیة البر. والصحیح: ترك الإظهار وکسرة القاف فی (من راق) و فتحة النون فی (بل ران) تکفی فی زوال اللبس) ﴿[٢٨] وظن انه الفراق﴾ وەزانی ئەوە ساتی جیابوونەوەیە لە دنیادا, ئیتر (نەخۆشەکە) یەقین پەیدا دەکا کە ئەو حاڵە ئەوی تێدایە بەئێجگاری مردن و کاتی ماڵئاوایی و جیابونەوەیە لەدونیادا، چونکە فریشتەکانی مەرگ دەبینێ ﴿[٢٩] والتفت الساق بالساق﴾ وەلاقێکی لەوی تری ئاڵا (کاتی گیان کێشان) لەبەر سەختی ڕۆژەکە ﴿[٣٠] إلی ربك یومئذ المساق﴾ ئەوڕۆژە حوکمی ڕاپێچکردن بۆ پەروەردگارتە بۆلێپرسینەوەو خواردنی بەری کێڵگەکەی خۆت.

**بێ باوەڕان و ئاییندەیان:**

﴿[٣١] فلا صدق ولا صلی﴾ جا مرۆڤی بێ باوەڕ لە بەر ئەوە کە نەبڕوای کردووەو نە نوێژیشی خوێندووە ﴿[٣٢] ولکن کذب وتولی﴾ بەڵکو قورئانی بەدرۆ زانیوەو ڕوویشی لێ وەرگێڕاوە, لە قیامەتدا خەجاڵەتە ﴿[٣٣] ثم ذهب إلی اهله یتمطی﴾ پاشان بەدەعیەو فیزەوە دەڕۆیشتەوە بۆ ناو ژن ومناڵەکەی.

جەماوەری زانایان لەسەر ئەوەن – وەك ئیمامی (نەسائیی) هێناویەتی- کە ئەومرۆ کەللەرەقە، نەفامە، (ئەبووجەهل)بووە.. ﴿٣٤ أولى لك فأولى﴾ جا پێی دەگوترێ تیاچوون بۆت! ﴿٣٥ ثم أولى لك فأولى﴾ پاشان بۆ (جارێکی تر) پێی دەوترێ: تیاچون بۆ تۆ تیاچون، واتە: ئاگاداربە لێت دووپات ئەکەمەوە، فریای خۆت بکەوە هەتا بەدەمتەوەماوە ﴿٣٦ أیحسب الإنسان أن یترك سدى﴾ ئایا ئادەمیی وادەزانێ وازی لێدەهێنرێ بە پشتگوێ خراوی وزیندوو ناکرێتەوەوەو پاداش و تۆڵە نیە.؟! ﴿٣٧ الم یك نطفة من منی یمنى﴾ ئاخۆ ئەو نوتفەوئاوێکی کەم نەبوو لە مەنی پیاو دەرێژرایە ناو منداڵدانەوە؟ ئەی بۆچی وازوو گۆڕا؟! ﴿٣٨ ثم کان علقة﴾ دوایی بووە خوێنێکی مەیوو خۆهەڵواسەر، وەك زەروو. ﴿فخلق فسوى﴾ ئینجا خوا دروستی کردو لە جوانترین شێوە ڕێکی خست وگەشەیکردو ڕۆحی وەبەر کردو، زۆر بەڕێك و پێکی لە جوانترین وێنەدا بەدیهێنا، ئەبۆ بیر ناکاتەوە؟ ﴿٣٩ فجعل منه الزوجین الذکر والأنثى﴾ جا هەر لەو دڵۆپە ئاوە جووتێ نێرومێی (کوڕ وکچ) بە دیهێنا بەدەسەڵاتی خۆی.. جا کەسێك ئاوا دروستکرابێت، چۆن یەکەم دروستکەری ئەو ناتوانێ بۆ جارێکی تر زیندووی بکاتەوە، وەك ئەفەرمووێ: ﴿٤٠ الیس ذلك بقادر على أن یحیی الموتى﴾ ئایا خوایەکی باڵادەستی وا ناتوانێ بۆجارێکی تر مردووەکان زیندو بکاتەوە؟ دیارە دەسەڵاتی هەیە بەسەر هەموو شتێکدا. (ئەبوو داوودو پێشەوا ئەحمەد) چەند فەرموودەیەك دێنن کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((من قرأ سورة "القیامة"فانتهی الی قوله:(الیس ذلك بقادر على أن یحیي الموتى)، فلیقل:(سبحانك فبلى))، وإذا قرأ سورة (والتین) فانتهى إلى قوله: (الیس الله بأحکم الحاکمین). فلیقل بلى: وأنا على ذلك من الشاهدین)). ومن قرأ (والمرسلات) فبلغ: (فبأی حدیث بعده یؤمنون) فلیقل: (آمنا بالله)). پەیامبەریش ﷺ کاتێ ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە ئەیفەرموو: ((سبحانك اللهم بلى)).

سُورَةُ القِيَامَةِ — الجزء التاسع والعشرون

كَلَّا بَلْ تُحِبُّونَ الْعَاجِلَةَ (٢٠) وَتَذَرُونَ الْآخِرَةَ (٢١) وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَاضِرَةٌ (٢٢)
إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ (٢٣) وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ بَاسِرَةٌ (٢٤) تَظُنُّ أَنْ يُفْعَلَ بِهَا فَاقِرَةٌ (٢٥)
كَلَّا إِذَا بَلَغَتِ التَّرَاقِيَ (٢٦) وَقِيلَ مَنْ ۜ رَاقٍ (٢٧) وَظَنَّ أَنَّهُ الْفِرَاقُ (٢٨) وَالْتَفَّتِ
السَّاقُ بِالسَّاقِ (٢٩) إِلَىٰ رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ الْمَسَاقُ (٣٠) فَلَا صَدَّقَ وَلَا صَلَّىٰ
(٣١) وَلَٰكِنْ كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ (٣٢) ثُمَّ ذَهَبَ إِلَىٰ أَهْلِهِ يَتَمَطَّىٰ (٣٣) أَوْلَىٰ لَكَ
فَأَوْلَىٰ (٣٤) ثُمَّ أَوْلَىٰ لَكَ فَأَوْلَىٰ (٣٥) أَيَحْسَبُ الْإِنْسَانُ أَنْ يُتْرَكَ سُدًى (٣٦)
أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِنْ مَنِيٍّ يُمْنَىٰ (٣٧) ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّىٰ (٣٨) فَجَعَلَ مِنْهُ
الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالْأُنْثَىٰ (٣٩) أَلَيْسَ ذَٰلِكَ بِقَادِرٍ عَلَىٰ أَنْ يُحْيِيَ الْمَوْتَىٰ (٤٠)

سُورَةُ الإِنسَانِ

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

هَلْ أَتَىٰ عَلَى الْإِنْسَانِ حِينٌ مِنَ الدَّهْرِ لَمْ يَكُنْ شَيْئًا مَذْكُورًا (١)
إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ مِنْ نُطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعًا
بَصِيرًا (٢) إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا (٣)
إِنَّا أَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ سَلَاسِلَ وَأَغْلَالًا وَسَعِيرًا (٤) إِنَّ
الْأَبْرَارَ يَشْرَبُونَ مِنْ كَأْسٍ كَانَ مِزَاجُهَا كَافُورًا (٥)

٥٧٨

ئەم فەرموودەیە کە سوونەتە پاش خوێندنی ئایەتی:(ألیس ذلك بقادر على أن یحیي الموتى) بوترێ: (سبحانك فبلى) ئیمامی ئەبووداود لەڕێگەیەکی (ڕاست)ەوە بەم لەفزەش ڕیوایەتی کردووە، بڕوانە(تمام المنة)ص١٨٦. قال: سبحانك اللهم فبلى).

سوپاسی بێپایان بۆ خوای گەورەو دلۆڤان، کەیارمەتیدام بۆ تەواوکردنی تەفسیری سوورەتی (قیامە).

*** *** ***

## ٧٦- سوورەتی ئینسان لـه

## مەدەنییەو ( ٣١ ) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتی (ئینسان)ە، هەرچەندە قسەی جیاواز هەیە بۆ دیارییکردنی باری مەدەنییەتیی و، مەککەییەتی، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا مەشرەبەکەی لەوە ئەچێ کە لەمەککەدا هاتبێ، هەر بۆیە (سەیید قوتب)یش دووەمیان هەڵدەبژێرێ. ئەم سوورەتە گشت ئادەمییەك بانگ دەكات بۆ گوێرایەڵی و بەرفەرمانیخوای گەورە و میهرەبان، بانگیان دەکات کە لە هەمووکاتێکدا تەنها پەنا بەخوا بەرن و، هەوڵ بدەن بۆ بەدەست هێنانی ڕەزامەندیی وخۆشنوودی خوا، گەلێ لە نازو نیعمەت و بەهرەکانی خوای گەورەی بۆ باس ئەکات،هە تاسوپاسگوزاری خوا بکات و، لە هۆکانی توشبوونی قارو سزای ئەو دوور وکەنار بگرێت.. بەئادەمزاد دەڵێت: دەزانیت پێش ئەوە بێیتە خانەی وجوودەوە لەکوێ بوویت..؟ ئەی دەزانیت کێ بەدی هێنایت و، چۆن هاتیتە خانەی بووەکانەوە..؟ (هل اتى على الإنسان حين من الدهر لم يكن شيئا مذكورا) بەکورتە باسێك لە قورئانی پیرۆز کۆتایی دێ.. هەر کەسێکیش بێدارو هۆشیار بێت، ئەوا ئەم قورئانە کەڵك و سوودی پێدەگەیەنێ و دەیخاتە سەر شارێگەی ژیان و بەرەو سەر بڵندی دنیاو قیامەت دەیبات. جا بەم شێوەیەش دەست پێ ئەکات: ﴿بسم الله الرحمن الرحيم * [1] هل اتى على الإنسان حين من الدهر﴾ بێگومان ماوەیەك لە ڕۆژگار بەسەر ئادەمیدا هاتووە ﴿لم يكن شيئا مذكورا﴾ ئەو هیچ شتێك نەبوو، تا باس و خواسێکی وای ببێ و، لە بوونەوەردا ناوێکی هەبێت.. ئیتر یان هێشتا هەر لەپشتی باوکیا بووە، یان لەم ئەرزەدا پێی بڵێیت ئادەمیی هەر وجودی نەبووە، کەسیش بە بیریدا نەهاتووە. جا کەوابوو ئەی ئادەمیی داچڵەکێ و خوای خۆت بەهەق بناسە ﴿[2] إنا خلقنا الإنسان من نطفة امشاج﴾ بێگومان ئێمە ئادەمیمان دروستکرد لە دڵۆپێك ئاوی تێکەڵاو لە هەردوو ئاوی ژن و پیاو، بەو شێوەیە کە خۆمان ویستمان بکاتە یەك، پاشان، هەر لەو تنۆکەیە سوار چاك، قارەمان، دەنگخۆش، چاك، خراپی لێ پەیدا بوو ﴿نبتليه﴾ تاقی دەکەینەوە لەناو گیان لەبەرەکانی تردا، وە بۆ خۆیشی دەر دەکەوێ کە ئایا کارو کردەوەی چاك ئەکات، یان خراپ، ئایا سوپاسمان ئەکات، یا سپڵە دەبێ؟ ﴿فجعلناه سميعا بصيرا﴾ ئینجا ژنەواو بینامان کرد بۆ ئەوەی ئایەتەکانمان بەگوێی خۆ ببیسێ، بەڵگەکانی دەسەڵاتمان بەچاوی خۆی ببینێ، بەشکو مل رابکێشێ بۆ حەقیقەت و ڕاستیی ﴿[3] إنا هديناه السبيل﴾ بێگومان ئێمە ڕێگەی (چاك و خراپ)مان پێنشاندا، سەر پشکمان کرد ﴿إما شاكرا وإما كفورا﴾ یان سوپاسگوزار(ئیماندار دەبێ) یان سپڵەو بێ باوەڕو خوا نەناس، ئەگەرچی زۆر جاریش لەفرمانمان دەر ئەچێ و ملی خۆی ئەشکێنێ، دیارە ئیتر ئەوکاتەش تەنها خۆی مجرۆ دەبێ و تەنها خۆیشی بەرپرسیار دەبێ.

### جەزای موسڵمانان و تۆڵەی بێ باوەڕان:

﴿[4] إنا اعتدنا للكافرين سلسلا واغلالا وسعيرا﴾ بەڕاستی ئێمە کۆت و زنیجر - کە هەردوو قاچ و پێی پێئەبەسترێتەوەو، هەردوو دەستیی بەگەردنیەوە پێ جەڕ دەدەرێ - لەگەڵ ئاگرێکی سوتێنەرو هەڵچیرساودا ئامادەمانکردووە بۆ بێ باوەڕەکان ﴿[5] إن الأبرار يشربون من كأس كان مزاجها كافورا﴾ بەڕاستی چاکانیش لە جامی پڕ لەشەرابی تایبەتی دەخۆنەوە کە تێکەڵەکەی(واتە:ئەوی تێکەڵی دەکرێ) کافوورە.

(کافور) مادەیەکی زۆر تامخۆش و بۆنخۆشە لە دارێکە لەوڵاتی (هند) و (چین)دا دەڕوێ, ئەڵبەت لەوسەردەمەدا لای خەڵکانی ئەو ناوچەیە ناسراو بووە ﴿[6] عينا يشرب بها عبادالله﴾ کانیاوێکە بەندەکانی خوا لێی دەخۆنەوە

﴿یفجرونها تفجیرا﴾ بۆ هەر شوێنێك بیانەوێ بیبەن دەیبەن بەئاسانی، واتە: بەهەشتییەکان لەهەر جێگایەکدابن و لەهەر ژوورێکدا بن ئاوەکەیان لەگەڵ دەبێ.

## ئاکاری چاکان:

﴿[٧] یوفون بالنذر﴾ بۆیە ئەم پاداشەیان هەیە، چونکە لە دونیادا هەر شتێ نەزر بکەن و بڕیاری لە سەر بدەن لە کارێکی چاکە، وەفای پێ دەکەن و پێی هەڵ ئەسن ،بێ کەم و کورتی. پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((من نذر أن یطیع الله فلیطعه، ومن نذر أن یعصی الله فلا یعصه))الموطأ: ٤٧٦/٢ واتە: هەرکەسێك بڕیاریدا کە دەبێ گوێرایەڵی خوا بێت، دەبێ جێبەجێی بکا، بەڵام کەسێ بڕیاریدا یاخی بێت لەخوا، نابێ قسەکەی جێبەجێ بکاو یاخی ببێت.

الجزء التاسع والعشرون | سورة الإنسان

عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا عِبَادُ ٱللَّهِ يُفَجِّرُونَهَا تَفْجِيرًا ٦ يُوفُونَ بِٱلنَّذْرِ وَيَخَافُونَ
يَوْمًا كَانَ شَرُّهُۥ مُسْتَطِيرًا ٧ وَيُطْعِمُونَ ٱلطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ مِسْكِينًا
وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا ٨ إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ ٱللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمْ جَزَآءً وَلَا شُكُورًا
٩ إِنَّا نَخَافُ مِن رَّبِّنَا يَوْمًا عَبُوسًا قَمْطَرِيرًا ١٠ فَوَقَىٰهُمُ ٱللَّهُ شَرَّ ذَٰلِكَ
ٱلْيَوْمِ وَلَقَّىٰهُمْ نَضْرَةً وَسُرُورًا ١١ وَجَزَىٰهُم بِمَا صَبَرُوا۟ جَنَّةً وَحَرِيرًا
١٢ مُّتَّكِـِٔينَ فِيهَا عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ ۖ لَا يَرَوْنَ فِيهَا شَمْسًا وَلَا زَمْهَرِيرًا ١٣
وَدَانِيَةً عَلَيْهِمْ ظِلَـٰلُهَا وَذُلِّلَتْ قُطُوفُهَا تَذْلِيلًا ١٤ وَيُطَافُ عَلَيْهِم بِـَٔانِيَةٍ
مِّن فِضَّةٍ وَأَكْوَابٍ كَانَتْ قَوَارِيرَا۠ ١٥ قَوَارِيرَا۟ مِن فِضَّةٍ قَدَّرُوهَا تَقْدِيرًا ١٦
وَيُسْقَوْنَ فِيهَا كَأْسًا كَانَ مِزَاجُهَا زَنجَبِيلًا ١٧ عَيْنًا فِيهَا تُسَمَّىٰ سَلْسَبِيلًا
١٨ ۞ وَيَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَٰنٌ مُّخَلَّدُونَ إِذَا رَأَيْتَهُمْ حَسِبْتَهُمْ لُؤْلُؤًا مَّنثُورًا
١٩ وَإِذَا رَأَيْتَ ثَمَّ رَأَيْتَ نَعِيمًا وَمُلْكًا كَبِيرًا ٢٠ عَـٰلِيَهُمْ ثِيَابُ سُندُسٍ
خُضْرٌ وَإِسْتَبْرَقٌ ۖ وَحُلُّوٓا۟ أَسَاوِرَ مِن فِضَّةٍ وَسَقَىٰهُمْ رَبُّهُمْ شَرَابًا
طَهُورًا ٢١ إِنَّ هَـٰذَا كَانَ لَكُمْ جَزَآءً وَكَانَ سَعْيُكُم مَّشْكُورًا ٢٢ إِنَّا
نَحْنُ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ تَنزِيلًا ٢٣ فَٱصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ وَلَا تُطِعْ
مِنْهُمْ ءَاثِمًا أَوْ كَفُورًا ٢٤ وَٱذْكُرِ ٱسْمَ رَبِّكَ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ٢٥

٥٧٩

﴿ویخافون یوما کان شره مستطیرا﴾ وە لە ڕۆژێك ئەترسن کە زیانەکەی بە هەموو شوێنێکدا بڵاو دەبێتەوە ﴿[٨] ویطعمون الطعام علی حبه مسکینا ویتیما واسیرا﴾ ونان وخۆراك لە گەڵ حەزو پێویستیان بۆی ، دەدەنە خەڵکانی بێ نەواو هەتیوو دیل، بڕێ جار ئەسیر دەهێنرایە لای پێغەمبەر ﷺ، ئەویش ئەیدایە دەستی موسڵمانەکان و، ئەوانیش زیاتر لەخۆیان خزمەتیان ئەکرد.. بەڵێ نان و خۆراکدان بەهەژارو هەتیوو دیل پیشەی موسڵمان بووەو، دەبێ تا ڕۆژی قیامەت بەردەوام بێت ﴿[٩] إنما نطعمکم لوجه الله﴾ و دەڵێن: ئێمە ئەم خۆراکەتان تەنها لەبەرخواو بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئەو پێدەبەخشین ﴿لا نرید منکم جزاء ولا شکورا﴾ هیچ پاداش و سوپاسێکمان لێتان ناوێ، بێ شك دەبێ هەموو خێرخوازێك هەرئاوابێت. ﴿[١٠] إنا نخاف من ربنا یوما عبوسا قمطریرا﴾ وەدەڵێن: بەڕاستی ئێمە لەڕۆژێکی زۆر ترش و تاڵ و سەخت و قورس لەپەروەردگارمان دەترسین ﴿[١١] فوقاهم الله شر ذلك الیوم﴾ جا خوا لە زیانی ئەو ڕۆژە دەیانپارێزێ ﴿ولقاهم نضرة وسرورا﴾ و ڕوو گەشی و شادمانیان پێدە بەخشێ ﴿[١٢] وجزاهم بما صبروا جنة وحریرا﴾ وپاداشیان دەداتەوە بە بەهەشتێك بە هەتا هەتایی تێیدا دەمێننەوەو بە ئاوریشمێك دەپۆشن ، بە هۆی ئارامگرتنیان لە سەر جێبەجێ کردنی تەکالیفی شەرعیی لە دنیادا. بەڵێ تەنها خوا پاداشی شیاوو شایستە ئەداتەوە، موسڵمانەکان هەرچی نان و خواردەمەنی خۆش و، کاڵای باش و قەشەنگیان هەبوو بەخشییان بەهەژارو هەتیوو دیلەکان، جائێستاش خوای گەورە ئاوا پاداشی دانەوە.

﴿[١٣] متکئین فیها علی الأرائك﴾ ئەو خۆشبەختانە لەسەر قەنەفەی ڕازاوەو جوان لە بەهەشتدا شانیان ﴿لا یرون فیها شمسا ولا زمهریرا﴾ نە گەرمایی خۆری تیا دەبینن و نە سەرمایەکیسارد، چونکە هەوایەکی مام ناوەندیی و، زۆر خۆش و سازگاری هەیە.﴿[١٤] ودانیة علیهم ظلالها﴾ و سایەوسێبەری درەختەکانی لێیانەوە نزیکە، تا زیاتر

هەست بەخۆشی و ڕێز و حورمەت بکەن ﴿وذللت قطوفها تذليلا﴾ ولێکردنەوەو چنینی میوەکەشیان ئاسان کراوە بۆیان.(ئیبن عەبباس) دەڵێ: بابای بەهەشتیی هەر کات حەزی لە هەر جۆرەمیوەیەك کرد، ئەوا خێرا لەدەمی نزیك دەبێتەوە، ئیتر نایەوێت ئەو عەزیەت بکێشێ و بڕوا بۆ لێکردنەوەی، بەڵکو خۆی دێتە لای ئەم.(سوفیان)یش گوتویەتی:دەستی بی میوەکەی دەگات چۆنی ویست, بەدانیشتنەوەو بە پاڵدانەوە. ﴿[15] ويطاف عليهم بآنية من فضة﴾ و لە سوراحیی و کاسەی زیودا وەشەرابیان بە سەردا دەگێردرێ بە قاپی زیوین ﴿وأكواب كانت قواريرا﴾ کە دەکرێتە ئەو کووپ و کاسانەوە لەزەرکی میناو شوشەی تایبەتدا دروستکراون ﴿[16] قوارير من فضة﴾ هەموو کاسەو سوراحی خواردن و خواردنەوەیان لەشووشەی زیوە ﴿قدروها تقديرا﴾ کە بەئەندازەییەکی جوان و پێویست و دڵڕفێن(ساقییەکان) ئامادەیان کردووە بۆیان، واتە: نە پێویستیان بە هی تر هەیە، وە نە لێشیان ئەمێنێتەوە.

**شەرابی ئاوێتە بە زەنجەفیل و چۆمی سەرسەبیل دەخۆنەوە:**

﴿[17] ويسقون فيها كأسا كان مزاجها زنجبيلا﴾ وەپێکێکیان پێدەنۆشرێ, تێکەڵەکەی زەنجەفیلە ﴿[18] عينا فيها تسمى سلسبيلا﴾ وە لە ئاوی کانیاوێکیش تێکەڵکراوە کە لەبەر خۆشقووتی پێی دەڵێن: (سەلسەبیل).

**لاوانی وەك مرواری ڕژێنراو، بەسەر بەهەشتدا دەگەڕێن:**

﴿[19] ويطوف عليهم ولدان مخلدون﴾ ولاوانێ کە هەر بە جوانی دەمێننەوە بەسەریاندا دەگەڕێن، بۆ خزمەتکردنیان شیاوی باسە هەرگیز پیریی و ناشیرینی و گۆڕان روویان تێناکات ﴿إذا رأيتهم حسبتهم لؤلؤا منثورا﴾ هەر کە دەیانبینی وادەزانیت مروارین و بەو ناوەدا بڵاو بوونەتەوە, دیارە خزمەتکار تا جوان و پاك و خاوێن تر بێت خزمەتکراوەکە دڵی باشترو زیاتر دەکرێتەوە. ﴿[20] وإذا رأيت ثم رأيت نعيما وملكا كبيرا﴾ وکاتێ بەهەر لایەکی ئەو بەهەشتەدا دەڕوانیت، نازو نیعمەت و بەهرەیەکی فراوان و موڵکێکی گەورەی بێ سنور دەبینی. واتە: نازانی سەیری چی بکەیت و گوێ بۆ چی بگری.

**جل و بەرگ و زەمبەریان:**

﴿[21] عاليهم ثياب سندس خضر وإستبرق﴾ لە بەریاندایەپۆشاکێ لە ئاوریشمی قەشەنگ ونەرم و نۆڵ و جوان و سەوزی تەنك، کە بەسەر ئاوریشمی ئەستووردا لەبەریان کردووە.

(سندس) ئاوریشمێکی نەرم و نۆڵە. (استبرق) ئاوریشمێکی ئەستوورو قاییمە ﴿وحلوا أساور من فضة﴾ وەرازێنراونەتەوە بە بازن و دەستبەندی زیو. بۆخزمەتکردنیان (سەعیدی کوڕی موسەییب) دەڵێ: هەموو بەهەشتییەك سێ جۆر بازن و دەستبەندی لەدەستدایە: زیوو، زێڕو، مرواریی ﴿وسقاهم ربهم شرابا طهورا﴾ وە پەروەردگرایان شەرابێکی پاك و پوخت و خاوێنیان پێدەنۆشێ ﴿[22] إن هذا كان لكم جزاء﴾ وە پێیان ئەوترێ: بەڕاستی ئەمەپاداشتێکە بۆ ئێوە ئامادە کراوە ﴿وكان سعيكم مشكورا﴾ و کۆشش و هەوڵی ئێوە سوپاسکراوە. بۆیە ئەمڕۆیش وا بەو شێوەیە پاداش ئەدرێنەوە.

جا پاش باسکردنی ئەو هەموو نازو نیعمەت و خۆشی و بەهرەیە بۆ بڕواداران و ترساندنی بێ بڕوایان، ئیتر دێتە سەر وانەیەك بۆ تەواوی بڕواداران تا بە ئارام بن و دان بەخۆدا بگرن. هەزار ڕەحمەت لە مامۆستا (خاڵ) کە چەندە جوان دەڵێت: سوورەتە مەککییەکان بۆ یەکەمجار قسە لەگەڵ بێ بڕواکانی قورەیش دەکەن، کە ئەوانیش زۆر حەزیان لە رابواردن بووە، جا لەبەرئەوە درێژترین باسی بەهەشت لەقورئاندا لەسوورەتی (ئینسان) و (طور)دایە، کە هەردووکیشیان مەککین، قورئانیش وەك پزیشك وایە، هەرکەسەی بەجۆرێ دەرمان ئەکات. هەندێك

حەزی لەباخ و باخات و میوەو گۆشت و کالای ئاوریشم و بازنی زێڕو زیوو مرواری و تەخت و قەنەفەو کورسییە. هەندێکیش حەزی لە میهرەبانی و نوری خوایە. ﴿[٢٣] إنا نحن نزلنا عليك القرآن تنزيلا ﴾ دڵنیاش بە ئەی پێغەمبەرﷺ هەر ئێمە بەچاك و پاك قورئانمان بۆ تۆ دابەزاند، تا خەڵکی پێ بێدار بکەیتەوە ﴿[٢٤] فاصبر لحكم ربك﴾ جا لە بەرامبەر فەرمانی پەروەردگارتەوە خۆ ڕابگرە ،چاوەڕوانبە خوا تۆڵەیان لێ ئەسێنێ ﴿ولا تطع آثما او كفورا﴾ وە بە فەرمانی هیچ گوناهبارێك ، یان زۆر کافرو سپڵەیەك لە بتپەرستەکانی هۆزەکەت مەکە ئەگەرچی تەواوی ماڵی دونیاشت بدەنێ ﴿[٢٥] واذكر اسم ربك بكرة واصيلا ﴾ و بەیانیان و ئێواران یادی ناوی پەروەردگارت بکە, واتە: لە نوێژی بەیانی و نیوەڕۆو عەسردا ﴿[٢٦] ومن الليل فاسجد له ﴾ وە لە بەشێکی شەودا سوجدەی بۆ بەرە , واتە: پەروەردگرایان نوێژی مەغریب و عیشا لەکاتی خۆیدا بکە ﴿وسبحه ليلا طويلا ﴾ وە لەبەشێکی زۆری شەودا تەسبیحات و بێخەوشی ئەو بڵێ: واتە: شەو نوێژ بکە وهەموو کات دڵت لای خوا بێ و ناوی ئەو هەر لەسەر زارت بێت. بەڵێ: دەبێ بانگەوازکاران لەهەر جێگایەکدا بن، توویشوویەکی زۆر هەڵگرن بۆ لای خوا، چونکە ڕێگەکەیان هەزار بەهەزارەو درێژو نەبڕاوەیە!

**بۆ دنیا وازیان لە قیامەت هێنا:**

﴿[٢٧] إن هؤلاء يحبون العاجلة ﴾ بەڕاستی ئەو بێ باوەڕانە حەزیان لەژیانی دونیای تەمەن کۆتایە، کە زۆر بەخێرایی تێدەپەڕێت ﴿ويذرون وراءهم يوما ثقيلا ﴾ وە ڕۆژێکی زۆر گران و سەخت و سەنگین پشتگوێ دەخەن و هیچ کارێکی بۆ ناکەن و بڕوایان پێی نیە ﴿[٢٨] نحن خلقناهم وشددنا اسرهم ﴾ چۆن فەرمانەکان پشتگوێ ئەخەن؟! خۆ هەرئێمە دروستمانکردوون لەنەبوونەوە هێناومانە بوونەوو ئەندام و جومگەکانی لەشیانمان یەکخست و قایم کرد تابەهێزو بەتوانابن ﴿وإذا شئنا بدلنا أمثالهم تبديلا ﴾ وە کاتێکیش بمانەوێ ئەوانە لادەبەین دەیانگۆڕین، بەتاقمێ دەیانگۆڕین چاکتر لەوان.

سورة المرسلات — الجزء التاسع والعشرون

وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَٱسْجُدْ لَهُۥ وَسَبِّحْهُ لَيْلًا طَوِيلًا ﴿٢٦﴾ إِنَّ
هَٰٓؤُلَآءِ يُحِبُّونَ ٱلْعَاجِلَةَ وَيَذَرُونَ وَرَآءَهُمْ يَوْمًا ثَقِيلًا ﴿٢٧﴾ نَّحْنُ
خَلَقْنَٰهُمْ وَشَدَدْنَآ أَسْرَهُمْ ۖ وَإِذَا شِئْنَا بَدَّلْنَآ أَمْثَٰلَهُمْ تَبْدِيلًا
﴿٢٨﴾ إِنَّ هَٰذِهِۦ تَذْكِرَةٌ ۖ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا ﴿٢٩﴾
وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٣٠﴾
يُدْخِلُ مَن يَشَآءُ فِى رَحْمَتِهِۦ ۚ وَٱلظَّٰلِمِينَ أَعَدَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًۢا ﴿٣١﴾

سُورَةُ المُرْسَلَاتِ — ترتيبها ٧٧ — آياتها ٥٠

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلْمُرْسَلَٰتِ عُرْفًا ﴿١﴾ فَٱلْعَٰصِفَٰتِ عَصْفًا ﴿٢﴾ وَٱلنَّٰشِرَٰتِ نَشْرًا ﴿٣﴾
فَٱلْفَٰرِقَٰتِ فَرْقًا ﴿٤﴾ فَٱلْمُلْقِيَٰتِ ذِكْرًا ﴿٥﴾ عُذْرًا أَوْ نُذْرًا ﴿٦﴾ إِنَّمَا
تُوعَدُونَ لَوَٰقِعٌ ﴿٧﴾ فَإِذَا ٱلنُّجُومُ طُمِسَتْ ﴿٨﴾ وَإِذَا ٱلسَّمَآءُ فُرِجَتْ
﴿٩﴾ وَإِذَا ٱلْجِبَالُ نُسِفَتْ ﴿١٠﴾ وَإِذَا ٱلرُّسُلُ أُقِّتَتْ ﴿١١﴾ لِأَىِّ يَوْمٍ أُجِّلَتْ
﴿١٢﴾ لِيَوْمِ ٱلْفَصْلِ ﴿١٣﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا يَوْمُ ٱلْفَصْلِ ﴿١٤﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ
لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿١٥﴾ أَلَمْ نُهْلِكِ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٦﴾ ثُمَّ نُتْبِعُهُمُ ٱلْءَاخِرِينَ
﴿١٧﴾ كَذَٰلِكَ نَفْعَلُ بِٱلْمُجْرِمِينَ ﴿١٨﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿١٩﴾

الأعلى ٥٨٠

**قورئان پەندەو، ڕێنمایی بە خوایە:**

﴿[٢٩] إن هذه تذكرة ﴾ بەڕاستی ئەم سوورەتەو هەموو ئایەتەکانی قورئان پەندو ئامۆژگاریەکە، بۆجیهانەکانی پەریی و ئادەمزاد, واتە: مرۆڤە ژیرەکان کەڵك و سوودی لێوەردەگرن و نەفامەکانیش پێی قەڵس دەبن! ﴿فمن شاء اتخذ إلى ربه سبيلا﴾ جا ئەوەی ویستی ڕزگاری ببێ لە ئاخیرەتدا , ڕێگایەکی ڕاست دەگرێ بۆلای پەروەردگاری ﴿[٣٠] وما تشاءون إلا أن يشاء الله ﴾ وە هیچ شتێك لەم شتانە ئارەزوو ناکەن, مەگەر کاتێ ویستی خوای لەسەر بێت. واتە: ئەگەر خوا حەز نەکات ئێوەش ناتوانن خۆتان ڕزگار بکەن لە ئازارو سزای ئەو، وە ڕێگای ڕاست ودروستیشتان پێناگیردرێ ﴿إن الله كان عليما حكيما ﴾ بەڕاستی ئەو خوایە زۆر زانایە , ئەزانێ کێ چی هەڵئەگرێ

و، شایستەی چییە؟ زۆریش کارجوان و کاردروستە، ئەگەر بیەوێ هۆ بۆ مرۆڤ دەست دەخاو سەرەنجام پیرۆز دەبێ، چونکە مرۆڤ تەنها کار کردنەکەی بەدەستە، ئیتر هێزو تواناو دروستکردن تەنها بە ویستی خوایە ﴿[31] یدخل من یشاء فی رحمته﴾ بۆیە ئەوەی ئەو بیەوێت لەبەندەکانی خۆی هۆی بۆ ڕێك دەخات و ئەیخاتە ناو رەحمەت و میهرەبانی (بەهەشتی) خۆیەوە ﴿والظالمین أعد لهم عذاباً الیما﴾ وەبۆستەمکارانیش سزایەکی پڕئێش و زۆر سەختی ئامادە کردووە. لەگەورەیی و فەزیلەتی سوورەتی (ئینسان)ـە کە ئیمامی (موسلیم) لە (ئیبن عەباس)وە دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ لەنوێژی بەیانی رۆژی هەینیدا (الم، تنزیل)ی سوورەتی سوجدەو، (هل أتى على الإنسان) دەخوێند. موسلیم/٢/٥٩٩.

سوپاسی شایستە بۆ خوای میهرەبان کە یارمەتیدام بۆ تەواو کردنی تەفسیری سوورەتی (ئینسان).

*** *** ***

## ٧٧- سوورەتی ( مورسەلات )

### مەککەییەو ( ٥٠ ) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

سوورەتی (مورسەلات)، گرنگی بەخاڵە بناغەییەو بنەڕەتیەکانی ئیسلام دەدا وەکو: ڕۆژی سەلاّوزیدوو بوونەوە، نیشانەو بەڵگەکانی دەسەلاّت وتوانایی خوای بالاّدەست و، چەندین شتی گرنگی تری نادیار. وەلە پێشەوە سوێند دەخوا بەچەندین جۆری فریشتە و، خەڵکانی پاك وپاکژ کە: قیامەت راستەو دێتە دی و، سزاو تیاچونیش بۆ بێ بڕوایان مسۆگەرەو بەرێوەیە: (والمر سلات عرفا.. إنما توعدون لواقع) پاشان کاتی‌ئەو سزایە دیاری دەکات: (فإذا النجوم طمست... لیوم الفصل) چەند نیشانەو بەڵگەیەکیش دێنێت لەسەر توانایی خوای گەورە بۆزیندو کردنەوەی ئادەمیزاد: (ویل یومئذ للمکذبین... الم نخلقکم من ماء مهین) پاشان دێتە سەر باسی ئەو سزاو ئەشکەنجەیە کە بۆ تاوانباران دانراوە: (إنطلقوا إلى ما کنتم به تکذبون... کأنه جمالة صفر) دوای دیاریکردنی تۆڵەی ئەوان، پاداش و جێگەی بڕوادارا نیش باس دەکات: (إن المتقین فی ظلال و عیون... انا کذلك نجزی المحسنین) بەکورتە باسێکی هۆی سەر کەشی و یاخیبووان و، ئەنجامەکەی بە فەرمایشتی: (..کلوا وتمتعوا قلیلا إنکم مجرمون..) دەرگا لەخۆی دائەخا.

### سوێند بەمانە رۆژی پەسلاّن دێ:

﴿بسم الله الحمن الرحیم * [1] والمرسلات عرفا﴾ سوێند بە (با)رەوانەکراوەکان یەك لە دوای یەك کە بەکاری پێویست و گرنگ دەنێردرێن ﴿[2] فالعاصفات عصفا﴾ بەو بایانەش کە بە هێزو توندی هەڵدەکەن بە هەڵکردنێکی بە هێزو توندوەبنە گەردەلوول ودارو درەخت لەبندێنن ﴿[3] والناشرات نشرا﴾ وە سوێند بەو بایانە کە هەور بلاّودەکەنەوە بە بلاّوکردنەوە لە ئاسماندا و باران دەهێنن ﴿[4] فالفارقات فرقا﴾ سوێند بەوئایەتانەش کەهەق و ناهەق،باتڵ و ناڕەوا لێك جیادەکەنەوە بەجیاکردنەوەیەکی روون ﴿[5] فالملقیات ذکرا﴾ سوێندیش بەو فریشتانە پەیام و نامەی خوا دەبەنە لای پەیامبەران،(دروودو سلاّویان لەسەربێت) ﴿[6] عذرا أو نذرا﴾ بۆ نەهێشتن و لابردنی بروو بیانووی خەڵك، یان بۆ ترس وە بەرنانیان، تابەڵکولە سزا بترسن و سڵ بکەنەوە ولە خراپە کۆتا بکەن , واتە: مەردم دوو جۆر دەبێ: یا بڕوا دێنێ، یا نایهێنێ. وە سوێند خواردنیش بەو شتانەی سەرەوە بۆ ئەوەیە: هەتا خەڵك بزانێ کە بوونەوەر پڕە لە ملیۆنەها شتی نادیار، وە هەریە کەشیان کاری خۆی ئەکات. (سەلەف) لە نێوخۆیاندا

لەمەڕ دیاریکردنی ماناو مەبەستی ئەوانەی سەرەوە قسەیان جیاوازە: هەندێ دەڵێن مەبەست پێیان بایە.هەندێ دەڵێن: فریشتەکانن. هەندێ تر دەڵێن: هەندێکیان (با)ن و،ئەوانی تریان فریشتەن. ئێمەش ملکەچین بەوە کەخوای گەورە خۆی چاك دەزانێت کەچ مانایە مەبەستە؟ ﴿٧ إنما توعدون لواقع﴾ سوێند بە هەمووئەوانە بەراستی ئەو وادەو بەڵێنە بە ئێوە دەدرێت، هەرپێشدێت ﴿٨ فإذا النجوم طمست﴾ جا کاتێ ئەستێرەکان رووناکیان نەماو سڕانەوە, واتە:لەجێگەی خۆیان ترازان و کوژانەوە ﴿٩ وإذا السماء فرجت﴾ وکاتێکیش ئاسمان یەکالاکرایەوەو لێك ترازا ﴿١٠ وإذا الجبال نسفت﴾ دەمێکیش کێوەکان لەجێگەی خۆیان هەڵدەکنرێن و تەخت ئەبن.. بەڵێ.. قورئان پڕە لەم دیمەنانە، کە هەریەکەیان پەنجە ئەخەنە سەر تێکچوون وهەڵوەشانەوەی یاسای ئەم بوونەوەرە ﴿١١ وإذا الرسل أقتت﴾ وکاتێك پەیامبەران کات وشوێنی دیارییان بۆدادەنرێت بۆ لێکۆڵینەوەو موحاکەمەی نێوان ئەوان و گەلەکانیان ﴿١٢ لأی یوم اجلت﴾ ئاخۆ بزانن بۆ چ ڕۆژێکی گەورەو سەخت لێپرسینەوە دواخراوە؟ ﴿١٣ لیوم الفصل﴾ بۆڕۆژی جیاکردنەوەو دادگایی لە نێوان دروستکراوەکاندا ﴿١٤ ومادراك ما یوم الفصل﴾تۆ چوزانیت ڕۆژی دادگایی وجیاکردنەوە چ ڕۆژێکی سەخت وگرانە؟ چەند قورس و.. سەختە..؟.. کاتێ ئەوانە ڕوویاندا، ئیتر ئەوکاتە هەرچی بەڵێنیان پێدراوەو پەیامبەرانیش پێیان وتوون، دێتەدی بێ دوو دڵیی وگومان ﴿١٥ ویل یومئذ للمکذبین﴾ سزاو تیاچوون لەو ڕۆژەدا بۆ بەدرۆخەرەوانی پێغەمبەرانە. راڤەکەرانی قورئان دەڵێن: لەم سوورەتەدا ئەم ڕستەی – ویل یومئذ للمکذبین–، بۆ تەماع خستنە بەرو ترساندن (١٠) جار وتراوەتەوە.

### بەمکارانە خوا بناسە:

﴿١٦ الم نهلك الأولین﴾ ئایا ئێمە تاقمی پێشینانمان لە ناو نەبرد؟ واتە:ئەوانەی پەیامبەرە کانیان بە درۆ دەخستەوەو دەچوون بەگژیاندا، وەکو گەلی (نووح وعادو سەموود؟)﴿١٧ ثم نتبعهم الآخرین﴾ لە پاشا بەدوای ئەواندا پاشینانیش دێنین , جائەگەر ئەوانیش لابدەن لەناویان دەبەین ﴿١٨ كذلك نفعل بالمجرمین﴾ ئابەو جۆرەیە لەگەڵ گشت تاوانباران مامەڵەو ڕەفتار دەکەین ﴿١٩ ویل یومئذ للمكذبین﴾ سزاوتیاچوون لەو ڕۆژەدا بۆ بەدرۆ خەرەوەکان ﴿٢٠ الم نخلقكم من ماءمهین﴾ئایا لەئاوێکی پەست ولاواز دروستمان نەکردن، ئەی خەڵکانی خوانەناس و بێ باوەڕ؟! ﴿٢١ فجعلناه فی قرار مكین﴾ جا خستمانە ناوجێگایەکی پتەو قایمەوە کەمندالدانە؟ ﴿٢٢ إلی قدرمعلوم﴾ وبۆماوەیەکی دیاریکراو ئەویش وەختی زایین و لەدایکبوونە؟ ﴿٢٣ فقدرنا فنعم القادرون﴾ جا ئێمە هەمووشتێکمان بەڕێکوپێکی بەدیهێنا، ئای چ خوایەکی چاك ئەندازەگیرە ئەو زاتە، ئەوەتە لەجوانترین وێنەدا ئێوەی دروست کردوو چارەنووسیشی دیاریکردوون ﴿٢٤ ویل یومئذ للمكذبین﴾ سزاو تیاچوون لەوڕۆژەدا بۆ بێ

الجزء التاسع والعشرون — سُورَةُ المُرسَلات

أَلَمْ نَخْلُقكُّم مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ ﴿٢٠﴾ فَجَعَلْنَٰهُ فِى قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴿٢١﴾ إِلَىٰ قَدَرٍ
مَّعْلُومٍ ﴿٢٢﴾ فَقَدَرْنَا فَنِعْمَ ٱلْقَٰدِرُونَ ﴿٢٣﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٢٤﴾
أَلَمْ نَجْعَلِ ٱلْأَرْضَ كِفَاتًا ﴿٢٥﴾ أَحْيَآءً وَأَمْوَٰتًا ﴿٢٦﴾ وَجَعَلْنَا فِيهَا رَوَٰسِىَ
شَٰمِخَٰتٍ وَأَسْقَيْنَٰكُم مَّآءً فُرَاتًا ﴿٢٧﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٢٨﴾
ٱنطَلِقُوٓا۟ إِلَىٰ مَا كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿٢٩﴾ ٱنطَلِقُوٓا۟ إِلَىٰ ظِلٍّ ذِى ثَلَٰثِ
شُعَبٍ ﴿٣٠﴾ لَّا ظَلِيلٍ وَلَا يُغْنِى مِنَ ٱللَّهَبِ ﴿٣١﴾ إِنَّهَا تَرْمِى بِشَرَرٍ
كَٱلْقَصْرِ ﴿٣٢﴾ كَأَنَّهُۥ جِمَٰلَتٌ صُفْرٌ ﴿٣٣﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٣٤﴾
هَٰذَا يَوْمُ لَا يَنطِقُونَ ﴿٣٥﴾ وَلَا يُؤْذَنُ لَهُمْ فَيَعْتَذِرُونَ ﴿٣٦﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ
لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٣٧﴾ هَٰذَا يَوْمُ ٱلْفَصْلِ جَمَعْنَٰكُمْ وَٱلْأَوَّلِينَ ﴿٣٨﴾ فَإِن كَانَ
لَكُمْ كَيْدٌ فَكِيدُونِ ﴿٣٩﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٤٠﴾ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى
ظِلَٰلٍ وَعُيُونٍ ﴿٤١﴾ وَفَوَٰكِهَ مِمَّا يَشْتَهُونَ ﴿٤٢﴾ كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ هَنِيٓـًٔا
بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٤٣﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٤٤﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ
لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٤٥﴾ كُلُوا۟ وَتَمَتَّعُوا۟ قَلِيلًا إِنَّكُم مُّجْرِمُونَ ﴿٤٦﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ
لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٤٧﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱرْكَعُوا۟ لَا يَرْكَعُونَ ﴿٤٨﴾ وَيْلٌ
يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٤٩﴾ فَبِأَىِّ حَدِيثٍ بَعْدَهُۥ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٠﴾

٥٨١

باوەڕان و بەدرۆ خەرەوەکان ﴿٢٥ الم نجعل الأرض كفاتا﴾ مەگەر ئێمە زەویمان نەکردە مەکۆو جێی کۆبونەوە ﴿٢٦ احياء وأمواتا﴾ بۆ ژیاوان و مردوان؟ ﴿٢٧ و جعلنا فيها رواسى شامخات﴾ و هەرلەوێشدا کێوی بەرزو بڵندو داکوتراومان دانەمەزراند، بۆئەوەی زەوی دامرکێ و هەڵتان نەدێرێ ﴿واسقيناكم ماء فراتا﴾ئەیئاوێکیخۆش و شیرینمان پێنەنۆشاندن﴿٢٨ ويل يومئذ للمكذبين﴾سزاوتیاچوون لەوڕۆژەدا بۆ خوا نەناس و بەدرۆخەرەوەکان.

**تاوانباران بەرەو جێی خۆیان لێدەخورێن:**

﴿٢٩ إنطلقوا إلى ماكنتم به تكذبون﴾ فریشتە بەدۆزەخییەکان دەڵێن: بێخۆڕاگرتن دەرچن بۆئەو سزایەی کەبەدرۆتان ئەزانێ و بڕواتان پێی نەبوو ﴿٣٠ إنطلقوا إلى ظل ذى ثلاث شعب﴾ دەرچن بۆ سێبەری ئەو دووکەڵە سێشاخەیە، کە لە چڕە دووکەڵی دۆزەخ پەیدا دەبێ. دووکەڵی چڕوپڕ کاتێ بەرز ئەبێتەوە بۆئاسمان، ئەگەر بەئاسایی بڕوات لە قورسی خۆیدا دەبێتە سێ بەشەوە مەبەست لەمەدائەوەیەکە ڕاست و چەپ و سەروویان هەرتاریکایی ودووکەڵە ﴿٣١ لاظليل ولا يغنى من اللهب﴾ ئەو سێبەرە نە سێبەرێکی فێنکی وەهایە تالە گڕو بڵێسەی ئاگری دۆزەخ بێ نیازتان بکاو بتانپارێزێت. پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: ((تدنى الشمس يوم القيامة من الخلق حتى تكون كمقدار ميل، فيكون الناس على قدر أعمالهم فى العرق، فمنهم من يكون إلى كعبيه، ومنهم من يكون إلى ركبتيه، ومنهم من يكون إلى حقويه (أى خصره) ومنهم من يلجم العرق إلجاما- وأشار رسول الله ﷺ بيده إلى فيه)) موسلیم. واتە: ڕۆژی قیامەت خۆر ئەوەندە لەخەڵك نزیك دەبێتەوە، هەر (میل)ێکی دەمێنێ بگاتە سەریان، جا ئەو دەمە مرۆڤەکان هەریەکە بەپێی کارو کردەوەی نالەباری خۆی لە نێو گەرما وعەرەقی خۆیدا گیرۆدە دەبێ، هەندێکیان تا هەردوو قولە پێی دەچەقن، هەندێ دیکە تاهەردوو ئەژنۆ، تاقمێ تر،تا هەردوو کەلەکەیان، دەستەیە تر تادەرگای دەمیان! ﴿٣٢ إنها ترمى بشرر كالقصر﴾ ئەو ئاگرە بزیسکەی وا فڕێدەدات دەڵێیت کۆشك وتەلاری گەورەیە ﴿٣٣ كأنه جمالة صفر﴾ هەر دەڵێی وشتری بەرگ زەردن، کاتێ کە ڕیز ئەگرن و یەك لەدوایەك ڕێگە ئەدەنەبەر، ئەو بریشکانەش هەرئاوا بەدوای یەکدا ریز ئەبن و روو دەکەنە دۆزەخییەکان ﴿٣٤ ويل يومئذ للمكذبين﴾ سزاو لە ناوچوون لەو ڕۆژەدا بۆ خوانەناس و بەدرۆ خەرەوەکان.

**تاوانکاران توانای پۆزش و قسەیان نامێنێ:**

﴿٣٥ هذا يوم لا ينطقون﴾ ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە قسەیان نامێنێ تا کەڵکێکی هەبێ بۆیان ﴿٣٦ ولا يؤذن لهم فيعتذرون﴾ و مۆڵەتیش نادرێن، تا بڕوبیانوو عوزر بێننەوە، دیارە ڕۆژی قیامەت حاڵەت و قۆناغەکانی زۆرن و لێك جیاوازن ﴿٣٧ ويل يومئذ للمكذبين﴾ سزاو تیاچوون لەو ڕۆژەدا بۆبەدرۆ خەرەوەکان ﴿٣٨ هذا يوم الفصل جمعناكم والأولين﴾ ئەمە ڕۆژی دادگایی و جیاکردنەوەی هەق و ناهەقە، ئێوەو هەموو نەوەکانی پێشینمان کۆکردۆتەوە ﴿٣٩ فإن كان لكم كيد فكيدون﴾ ئینجا ئەگەر دەتوانن و لەئاست مندا دەسەڵات و فێڵێکتان هەیە، منەتتان نەبێت بەکاری بێنن و خۆتانی پێ چارە بکەن، وەك ئەفەرمووێ: (يا معشر الجن والإنس إن استطعتم أن تنفذوا من أقطار السموات والأرض فانفذوا..)٥٥/ ٣٣. دیارە هەرگیز ناتوانن دەرچن و خۆ ڕزگار بکەن، ئەوانیش هەروا ﴿٤٠ ويل يومئذ للمكذبين﴾ سزاو تیاچوون لەو ڕۆژەدا بۆ بەدرۆ خەرەوەکان.

**پارێزگاران لە سێبەرو کانیاوەکانی بەهەشتدان:**

﴿٤١ إن المتقين فى ظلال وعيون﴾ بەڕاستی خۆپارێزان و لەخوا ترسان لەبن سێبەرو، لای کانیاوەکانن ﴿٤٢ وفواكه مما يشتهون﴾ وە لەهەر جۆرە میوەیەك ئارەزووی بکەن بۆیان ئامادە دەکرێت ﴿٤٣ كلوا واشربوا هنيئا بما

كنتم تعملون﴾ پێیان ئه‌وترێ: ده‌سا به‌هۆی ئه‌وكاره چاكانه‌وه له‌ دونیادا كردوتانن، بخۆن و بخۆنه‌وه به‌ خۆشیی و نۆشتان بێت ﴿٤٤ إنا كذلك نجزی المحسنین﴾ دڵنیابن ئێمه‌ ئابه‌وشێوه‌یه‌ پاداشی گشت چاكه‌ كاران ئه‌ده‌ینه‌وه ﴿٤٥ ویل یومئذ للمكذبین﴾ سزاو تیاچوون له‌ورۆژه‌دا بۆخوانه‌ناس و به‌درۆخه‌ره‌وه‌كان ﴿٤٦ كلوا وتمتعوا قلیلا إنكم مجرمون﴾ ئێوه‌یش ئه‌ی خوانه‌ناسان! له‌ دونیادا بخۆن و رابوێرن به‌ئاره‌زووی خۆتان، چونكه‌ به‌ڕاستی ئێوه تاوانكارو تاوانبارن ده‌ره‌نجام پاشه‌رۆژێكی ره‌شتان ده‌بێ، هه‌روه‌ك ده‌فه‌رموێ: (نمتعهم قیلا ثم نضطرهم إلى عذاب غلیظ)٣١/٢٤. یان ده‌فه‌رموێ: (ثم نذیقهم العذاب الشدید بما كانوا یكفرون). ﴿٤٧ ویل یومئذ للمكذبین﴾ سزاو تیاچوون له‌و رۆژه‌دا بۆ به‌درۆ خه‌ره‌وه‌كان ﴿٤٨ وإذا قیل لهم اركعوا لا یركعون﴾ خۆ كاتێ چ له‌دونیادا، چ له‌قیامه‌تدا پێیان بگوترێ: كڕنوش و ركوع ببه‌ن بۆخوا، ركوع و سوژده‌ نابه‌ن، واته‌: نوێژی بۆ ناكه‌ن كاتێ كه‌ له‌دونیاد بوون به‌عه‌یبیان ده‌زانی ركوع و سوژده‌ به‌رن! دیاره‌ له‌ولایش -واته‌: رۆژی سه‌لاَ- ناتوانن بچه‌مێنه‌وه ﴿٤٩ ویل یومئذ للمكذبین﴾ سزاوتیاچوون له‌و رۆژه‌دا بۆ به‌درۆخه‌ره‌وه‌كان ﴿٥٠ فبأی حدیث بعده یؤمنون﴾ ئیدی به‌م قورئانه‌ بڕوا نه‌هێنن، ئه‌ی به‌كام قسه‌ -پاش ئه‌و- بڕوا دێنن؟! دیاره‌ ته‌نها قورئان زۆرشیاوو به‌رهه‌قه‌ بۆئه‌وه‌ی، بڕوای پێ بێنن، كه‌چی ئه‌وانه‌ بڕواناهێنن؟!.(ئیبن ئه‌بوو حاته‌م) له‌ (ئه‌بوو هوره‌یره‌)وه‌ ده‌ڵێت: هه‌ركاتێ سووره‌تی (مورسه‌لات) بخوێنرێت تاكۆتایی: (فبأی حدیث بعده یؤمنون) هه‌قه‌ قورئان خوێنه‌كه‌ بڵێت: (آمَنْتُ بالله وبما أَنْزَلَ).

جا له‌گه‌وره‌یی و فه‌زڵی سووره‌تی (مورسه‌لات)، ئیمامی (بوخاریی) له‌ (عه‌بدوڵڵای كوڕی مه‌سعوود)ـه‌وه ده‌گێڕێته‌وه‌ وده‌ڵێت: كاتێ سووره‌تی (والمرسلات) هات، ئێمه‌ له‌ته‌ك پێغه‌مبه‌ردا ﷺ له‌ئه‌شكه‌وتێكدا بووین له‌ (مونا)دا، ئاگادارم كه‌ پێغه‌مبه‌ر ﷺ چه‌ند به‌باشی ده‌یخوێنده‌وه‌و، منیش له‌ده‌میم وه‌ر ده‌گرت، ده‌میشی زۆر پاراو بوو پێی، له‌ناكاو مارێك په‌لاماریدا، پێغه‌مبه‌رﷺ فه‌رمووی: (بیكوژن). ئێمه‌یش به‌په‌له‌ هه‌ڵسایین بۆ كوشتنی. به‌ڵام بۆمان نه‌كوژراو ده‌رچوو! پاشان فه‌رمووی: ((وُقِیَتْ شرَّكُمْ كَما وُقِیتُمْ شرّها)) متفق علیه. واته‌:ئه‌و له‌شه‌ڕی ئێوه پارێزرا، وه‌كو ئێوه‌ له‌ شه‌ڕو زیانی ئه‌و پارێزران!

كۆتایی ته‌فسیری سووره‌تی (مورسه‌لات)

كۆتایی جزمی بیست و نۆیه‌م

و لله الحمد و المنة

*** *** ***

## ٧٨- سووره‌تی (نه‌به‌ء)ـه‌

## مه‌ككه‌ییه‌و (٤٠) ئایه‌ته

### به‌ناوی خوای به‌خشنده‌ی میهره‌بان

ئه‌م سووره‌ته‌ زیاتر به‌ده‌وری دووپاتكردنه‌وه‌و چه‌سپاندنی زیندوبوونه‌وه‌دا ده‌سووڕێ، چونكه‌ هاوه‌ڵ دانه‌ران و هاوبه‌ش په‌یداكه‌ران ئینكاریی و ململانێ ی زۆریان له‌سه‌ر ئه‌كرد، بۆیه‌ هه‌ر له‌سه‌ره‌تاوه‌ هه‌واڵی رووداوی رۆژی قیامه‌ت و زیندوو بوونه‌وه‌و پاداشت و تۆڵه‌ راده‌گه‌یه‌نێت: (عم یتساءلون* عن النبأ العظیم..) ئینجا به‌ڵگه‌یه‌كی زۆری هه‌مه‌جۆر دێنێته‌وه‌ له‌سه‌ر ده‌سه‌ڵات و توانایی په‌روه‌ردگاری جیهانه‌كان و، پێت ده‌ڵێت:ئه‌و خاوه‌ن ده‌سه‌ڵات و توانایه‌ كه‌ ئه‌و هه‌موو شته‌ سه‌رسوڕهێنه‌رانه‌ی به‌دیهێناوه‌، هه‌ر ئه‌ویش ده‌توانێ -زۆر به‌ئاسانتر- بۆ جارێكی تر ئاده‌میی زیندوو بكاته‌وه: (ألم نجعل الأرض مهادا.. وجعلنا نومكم سباتا) پاشان كاتی هاتنی رۆژی دوایی

بەچەند نیشانەو بەڵگەیەك دەست نیشان ئەكات، كەیی و چۆن دەست پێ ئەكات؟: (إن يوم الفصل كان ميقاتا.. يوم ينفخ في الصور فتأتون افواجا..).

كورتە باسێكی دۆزەخ دێنێت بەو هەموو ئازارو سزایەوە كە بۆ دۆزەخییەكان ئامادەكراوە: (إن جهنم كانت مرصادا * للطاغين مآبا) بۆ دواتر دەچێتە سەر باسی كرێ و پاداشی خواناسان و پارێزگاران و ئەو هەموو نازوونیعمەت و بەهرەیانە دەدات كە بۆیان ئامادە كراوە..: (إن للمتقين مفازا * حدائق وأعنابا.. وكأسا دهاقا..) كۆتاییشی بەباسكردنی حاڵەت و باری سەختیی و گرانیی و قورسیی ڕۆژی دوایی و چارەنووسی بێ بڕوایان دێ..: (إنا أنذرناكم عذابا قريبا.. ويقول الكافر يا ليتني كنت ترابا) هەر ئەو كاتەی كە پەیامبەر ﷺ بانگی قەوم و گەلەكەی خۆی ئەكرد بۆ بڕواهێنان بەزیندووبوونەوە، ئەو خوا نەناسانە لەناو خۆیاندا لە موسڵمانانیان دەپرسی: تۆ بڵێیت هاتنی ڕۆژی قیامەت ڕاست بێت؟ جائەگەر هەبێ ئەی كەی دەبێ؟ ئەوسا ئەم سوورەتەی (نەبەء)ە هاتە خوارەوە.

**بەڵگە گەلێ بۆ زیندووبوونەوەی پاش مردن:**

﴿بسم الله الرحمن الرحيم* [1] عم يتساءلون﴾ ئەو خەڵكە دەربارەی چی لەیەكتر دەپرسن؟ ﴿[2] عن النبأ العظيم﴾ دەربارەی هەواڵە زۆر گەورەو گرنگەكە ئەپرسن؟ كە ئەوان هەمیشە نكوڵیی و، ململانێی ئەكەن، هەرگیز پێیان وانیە كەئەو ڕووداوە ڕوودەدا و دەبێ! بۆیە ئەوەندە بەگاڵتەوە لەناو یەكتردا باسی ئەكەن! ﴿[3] الذي هم فيه مختلفون﴾ ئەوەی ئەوان لەسەری مشت و مڕیانە هەندێ ئینكاری دەكا، هەندێكیشی گومانی تیاهەیە! ﴿[4] كلا سيعلمون﴾ نەخێر، باكۆتایی بێنن بەو مشت ومڕەیان، چونكە لە ئاییندەیەكی نزیكدا چاك ئەزانن كە چۆن ئەبێ، بەتایبەت كاتێ بەچاوی سەر بینیان ﴿[5] ثم كلا سيعلمون﴾ هەمیسان بۆ جارێكی تر پرسی پێناوێ، لەداهاتوویەكی نزیكدا ئەزانن، چ سزاو بەلاّیەكیان دووچار ئەبێ.

الجزء الثلاثون — سورة النبإ

سورة النبإ ٧٨ — آياتها ٤٠

بسم الله الرحمن الرحيم

عم يتساءلون ﴿١﴾ عن النبإ العظيم ﴿٢﴾ الذي هم فيه مختلفون ﴿٣﴾
كلا سيعلمون ﴿٤﴾ ثم كلا سيعلمون ﴿٥﴾ ألم نجعل الأرض مهادا ﴿٦﴾
والجبال أوتادا ﴿٧﴾ وخلقناكم أزواجا ﴿٨﴾ وجعلنا نومكم سباتا
﴿٩﴾ وجعلنا الليل لباسا ﴿١٠﴾ وجعلنا النهار معاشا ﴿١١﴾ وبنينا
فوقكم سبعا شدادا ﴿١٢﴾ وجعلنا سراجا وهاجا ﴿١٣﴾ وأنزلنا
من المعصرات ماء ثجاجا ﴿١٤﴾ لنخرج به حبا ونباتا ﴿١٥﴾ وجنات
ألفافا ﴿١٦﴾ إن يوم الفصل كان ميقاتا ﴿١٧﴾ يوم ينفخ في الصور
فتأتون أفواجا ﴿١٨﴾ وفتحت السماء فكانت أبوابا ﴿١٩﴾ وسيرت
الجبال فكانت سرابا ﴿٢٠﴾ إن جهنم كانت مرصادا ﴿٢١﴾ للطاغين
مآبا ﴿٢٢﴾ لابثين فيها أحقابا ﴿٢٣﴾ لا يذوقون فيها بردا ولا شرابا
﴿٢٤﴾ إلا حميما وغساقا ﴿٢٥﴾ جزاء وفاقا ﴿٢٦﴾ إنهم كانوا
لا يرجون حسابا ﴿٢٧﴾ وكذبوا بآياتنا كذابا ﴿٢٨﴾ وكل شيء
أحصيناه كتابا ﴿٢٩﴾ فذوقوا فلن نزيدكم إلا عذابا ﴿٣٠﴾

إن للمتقين — ٥٨٢

ئینجا بۆ چەسپاندنی هاتنی ئەو ڕۆژەیە نۆ بەڵگە دێنێتەوە بۆیان، تا باش بزانن كە خوایەك ئەوەندە دەسەڵاتدار بێ و ئەو هەموو شتانە بكات، هەر ئەو خواش زۆر بەئاسانتر، هەمیسان زیندوویان ئەكاتەوە. بەڵگەكان:

١) ﴿[6] ألم نجعل الأرض مهادا﴾ ئەرێ ئێمە ئەم زەویەمان نەكردۆتە لانك و بێشكەو جێی ئارامگرتن بۆتان، تا بەئاسوودەیی بژین و بڕۆن و ژیانی تێدا بەرنەسەر؟.

٢) ﴿[7] والجبال أوتادا﴾ ئەی چیاو كێوەكانیشمان وەك مێخ بۆدانەكوتیون و زەویمان پێ نەبەستۆتەوە، تا هەڵتان نەدێرێ و نەتانفەوتێنێ؟

٣) ﴿وخلقناكم ازواجا﴾ ئایا بەجووت (نێرو مێ) دروستمان نەکردوون؟ بۆ ئەوەی درێژە بە ژیان بدرێ بەسەرپشتی ئەم ئەستێرەی زەوییەوە، وەك ئەفەرموێ: (ومن آیاته ان خلق لكم من انفسكم أزواجاً لتسكنوا إليها وجعل بينكم مودة ورحمة)٢١,/٣٠

٤) ﴿وجعلنا نومكم سباتا﴾ وە خەوو نووستنمان بۆ نەکردوون بە هۆی سەرەوتن و حەسانەوەتان، لەماندوویی و ئێش و ئازاری ژیانتان؟.

٥) ﴿وجعلنا الیل لباسا﴾ ئایا شەوگارمان نەکردووە بەکلاو پۆشاك بۆتان؟ هەروەکو کالا مەردوم دائەپۆشێ و، لەسەرماو گەرما دەیپارێزێت، هەر ئاوایش شەوگار مرۆڤ ئەشارێتەوە و دەیپارێزێ لەپەلاماری دوژمن" بۆیە ئەفەرموێ: (والليل إذا يغشاها..)٤,/٩١

٦) ﴿وجعلنا النهار معاشا﴾ ئایا رۆژیشمان بۆ نەکردونەتە هۆی بەدەسهێنانی بژێوی ئاسوودەیی و خۆشگوزەرانی؟

٧) ﴿وبنینا فوقكم سبعا شدادا﴾ ئایا حەوت چین (ئاسمانی) بەهێزو بتەوو قایممان بەڕاسەرتانەوە دروست نەکردووە؟ کە مەگەر تەنها ئەو خوا گەورەیە خۆی بزانێ ئەو حەوت ئاسمانە چی بن؟ حەوت کەشکەشانە - کەکۆمەڵە ئەستێرەیەکن- هەر کۆمەڵەیان سەد ملیۆن ئەستێرەیە، یان ئەوانە نیەو، چەندین ئەستێرەی ترن..؟ وەلامی ئەمانە -ئەمرۆ- هەمووی ئەدەینە دەستی خوای کار رەوان و کارزان.

٨) ﴿وجعلنا سراجا وهاجا﴾ ئایا چرایەکی درەخشانمان -وەك خۆر- بۆ فەراهەم نەهێناون، کە زەویتان روناك بکاتەوە و ریگەی خۆتانی پێ دەربکەن و، تیشکەکەیشی میوەو گەنم و دانەوێڵەکانتان پێ بگەیەنێت؟

٩) ﴿وانزلنا من المعصرات ماء ثجاجا﴾ ئەی ئایا لەهەورە گوشراوەکاندا بارانی بەلێزمەمان نەباراندووە؟ وەك دەفەرمووێ: (والله الذی أرسل الرياح فتثير سحاباً فسقناه إلى بلد ميت..)٩/٣٥.

﴿لنخرج به حبا ونباتا﴾ تادەربێنین بەهۆی ئەو بارانەوە جۆرەها دانەوێڵەو گژو گیاو رووەك ﴿وجنات الفافا﴾ چەندین باخ و باخاتی چرو پرو تێك ئالاو کە بەهۆی ئاوەوە دێنە بەرو گەلاو لق و پۆپ دەر ئەکەن بەدی بێنین، ئایا خوایەك ئەوەندە میهرەبان بێت لەگەڵ ئادەمیدا شایستەی ئەوە نییە کە بڕوای پێ بێنن؟ ئەی ئایا لەئاییندەدا توانای نییە مرۆڤ زیندوو بکاتەوە بۆ پاداشت و تۆڵە؟ وەك ئەفەرمووێ: (وفي الأرض قطع متجاورات وجنات من اعناب وزرع ونخيل صنوان وغير صنوان يسقى بماء واحد..)٤/١٣.

**رۆژی هەلاواردن بەرێوەیە:**

ئیتر باسی ئەو هەواڵە سامناکە دەکات کە دەفەرموێ: ﴿إن یوم الفصل كان میقاتا﴾ بەڕاستی رۆژی جیاکردنەوەو موحاکەمەی نێوان مەردوم کاتێکی دیاریی کراوە لای خوا، هەرگیز پاش و پێش ناکات، وەك ئەفەرمووێ: (وما نؤخره إلا لأجل معدود) ١٠٤/١١ ﴿یوم ینفخ في الصور﴾ ئەو رۆژەی کە فوو دەکرێ بە شەیپووردا ﴿فتأتون افواجا﴾ ئەوجا ئێوە پۆل پۆل و دەستە دەستە بەرەو مەیدانی لێپرسینەوە دێن، واتە: لەگۆڕەکان هەڵدەستن بۆ حیساب و لێکۆڵینەوە، جا ئەو شەیپوورە.. چۆنەو چۆن دەبێ، ئێمە هیچی لێ نازانین، خوای گەورەیش هەر ئەوەندەی فەرمووە، خۆئەگەر پێویست بوایە، ئەوا شیدەکردەوە، وەك لەئایەتێکی تردا ئەفەرموێ: (یوم ندعوا كل اناس بإمامهم..)٧١/١٧. (ئەبو هورەیرە) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەندازەی ماوەی نێوان هەردوو نەفخەکە چلە، وتیان چل رۆژە؟ فەرمووی: نایڵێم. وتیان: چل مانگ؟ فەرمووی: نایڵێم. وتیان:

چل ساڵ؟ فەرمووی: نایڵێم. جا فەرمووی: لەپاشان خوا ئاوێ لەئاسمانەوە دەنێرێ، هەروەکو گژوگیا و رووەك سەوز ئەبێتەوە، هەر ئاوایش مرۆڤەکان هەموو زیندوو ئەبنەوە، وە تەواوی ئەندامەکانی ئادەمیی دەڕزێن و یەك ئێسکی نەبێ کە پێی دەڵێن: (عجب الذنب) وە هەر لەویشەوە مرۆڤەکان دروست دەکرێنەوە، فتح الباری: ٥٥٨/٨.

﴿[١٩] وفتحت السماء فكانت ابوابا﴾ لەسەختی ئەو رۆژەدا ئاسمان دەکرێتەوە و لەت لەت ئەبێ و دەبێتە دەرگای هاتوو چۆی فریشتەکان، پاش ئەوەی کەزۆر توندو قایم بەستراببوو بەیەکەوە ﴿[٢٠] وسيرت الجبال فكانت سرابا﴾ کێوەکانیش هەڵدەکەنرێن و دەخرێنە رۆیشتن بەئاسمانداو دەبنە "سەراب – تراویلکە" لە دوورەوە ورشە ورشی دێ و بەئاو دەزانرێت، کەچی لەنزیکەوە ئاو نیە، واتە: چیاکان ئەبنە تۆزو گەردو ئەچن بەهەوادا، وەك لە سوورەتی تردا ئەفەرمووێ: (وتكون الجبال كالعهن المنفوش) ٥/١٠١. ﴿[٢١] إن جهنم كانت مرصادا﴾ بەڕاستیی دۆزەخیش دەمێکە چاوەڕوانی بێ بڕوایان دەکات ﴿[٢٢] للطاغين مآبا﴾ بۆ یاخیبووان جێگاو مەنزڵگەیە ﴿[٢٣] لابثين فيها أحقابا﴾ هەزارەها ساڵی بێسنوورو نەبڕاوە تیا دەبن، واتە: هەرگیز ڕزگاریان نابێ لێی ﴿[٢٤] لا يذوقون فيها بردا ولا شرابا﴾ هیچ فێنکییەك و شەرابێکی خۆشی تیا ناچێژن "بۆ سووك بوونی گەرماکەی، بەڵکو هەر ئاوا لەو حاڵەتە زۆر تەنگ و ناخۆشەدا دەمێننەوە ﴿[٢٥] إلا حميما وغساقا﴾ جگە لە ئاوێکی" زۆر گەرم و کولیو" و کیم و چڵکی "دۆزەخیان" ﴿[٢٦] جزاء وفاقا﴾ ئەویش پاداشتێکی پڕاوپڕە بەرامبەر بەکردەوەکانیان، واتە: لەو پاداشەدا ستەمیان لێ نەکراوە، چونکە هەر ئەو تۆڵەیە هەڵئەگرن ﴿[٢٧] إنهم كانوا لا يرجون حسابا﴾ چونکە بەڕاستی ئەوانە لەدنیادا بەتەمای لێپرسینەوەی ئەمرۆژە نەبوون ﴿[٢٨] وكذبوا بآياتنا كذابا﴾ بەڵکو زۆر بەتوندیش ئایەتەکانی ئێمەیان بەدرۆ ئەخستەوە و بەدرۆیان دەزانین ﴿[٢٩] وكل شئ أحصيناه كتابا﴾ ئێمەیش هەموو شتێکمان لەسەریان ئەژماردووە بەنووسین ﴿[٣٠] فذوقوا فلن نزيدكم إلا عذابا﴾ ئینجا پێیان ئەوترێ: دە بچێژن کە لە سزای سەخت و ئازار بەولاوە هیچتان بۆ زیاد ناکەین، واتە: تا ئێوە بپاڕێنەوە بۆ ڕزگار بوون، ئێمە سزاتان بۆ زیاتر ئەکەین.

## رۆژی بە ئاوات گەیشتن:

﴿[٣١] إن للمتقين مفازا﴾ بەڕاستیی بۆ خواناسان و خۆپارێزان " لەپاشەڕۆژدا " سەرفرازیی و پیرۆزیی و" رزگار بوون لەسزای دۆزەخ هەیە ﴿[٣٢] حدائق وأعنابا﴾ چەندین باخ و باخات و بێستان و ترێ و میوەی جۆراو جۆری ڕازاوە، هەرچی نەفس حەزی لێ بکات ﴿[٣٣] وكواعب أترابا﴾ کیژۆ کچانی هاوتەمەن و مەمك خڕو دیمەن جوان و تازە پێگەیشتوو ئامادەیە.

(كواعب): بەو کچانە ئەڵێن کە تازە مەمکان خڕ دەکەن، ﴿[٣٤] وكأسا دهاقا﴾ لەگەڵ جامی پڕ لەشەرابی پاك و خاوێندا ﴿[٣٥] لايسمعون فيها لغوا ولا كذابا﴾ کە لەو بەهەشتەدا هیچ قسەیەکی پڕو پووچ و نابەجێ، یاخود بەدرۆ خستنەوەیەك نابیسن، واتە: جێگەی گاڵتەو لاقرتیی و مەسخەرە نیە (لا لغوٌ فيها ولا تأثيم) ٢٣/٥٢. ﴿[٣٦] جزاء من ربك عطاء حسابا﴾ ئەمەش هەموو پاداشێکە لە لایەن پەروەردگارتەوەیە، بەخشش و بەهرەیەکە "بەپێی کارە چاکەکانیان، پێیان دەبەخشرێت، واتە: مافی خۆیانە ئابەو شێوەیە پاداشت بدرێنەوە. بەڵێ.. ئادەمیزاد هەریەکەی بەشتێ ئەگیرێ و، حەزی لەشتێکە.. هەر بۆیەش قورئان خەڵاتی جۆراوجۆریان دەکات.

## کەسێ ناوێرێ خوا بدوێنێ رۆژی سەلا:

﴿[٣٧] رب السموات والأرض وما بينهما الرحمن﴾ ئەو خوایە پەروەردگاری میهرەبانی ئاسمانەکان و زەویی و ئەوەی لەنێوانیاندا هەیە، هەموو خێرو چاکەیەك هەر لەژێر سێبەری میهرەبانی ئەودا دەبێت ﴿لا يملكون منه

خطابا﴾ هەرچەندە ئەوەندەیش میهرەبانە.. بەڵام بێ مۆڵەتی خۆی مافی هیچ قسەیەکیان نییە، وەك دەفەرموێ: (من ذا الذی یشفع عندە إلا بإذنە..)٢/٢٥٥. یان دەفەرموێ: (یوم یأت لا تکلم نفس إلا بإذنە..)١١،١٠٥. لە فەرموودەی باوەڕپێکراودا هاتووە: (ولا یتکلم یومئذ إلا الرسل..)فتح الباری: ١٣/٤٣٠. واتە: پێغەمبەران نەبێ کەسێکی دی قسە ناکا لەو ڕۆژەدا. ﴿[٣٨] یوم یقوم الروح والملائکة صفا﴾ لەو ڕۆژەدا کە ڕۆح (جوبریل) و فریشتەکان بەڕیز ڕائەوەستن وەل کەچن ﴿لا یتکلمون إلا من أذن لە الرحمن وقال صوابا﴾ و هیچیان قسە ناکەن، مەگەر کەسێ خوای بەخشندە ڕێگەی بدا، وە لەهەمان کاتیشدا قسەی شیاوو بەجێ بکات، واتە: فریشتەکان لەگەڵ ئەوەیشدا کە زۆر نزیکن بەخواوە بۆیان نیە هیچ شتێك بڵێن.. بەبێ ئیزنی خوا ئیتر خەڵکێکی تر لەخۆیەوە چۆن ئەتوانێ تکا بکات ﴿[٣٩] ذلك الیوم الحق﴾ ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی ڕاست و بەرحەقەو هیچ گومانی تیا نیە و بەڕێوەیە ﴿فمن شاء اتخذ إلى ربە مآبا﴾ جائەوەی ئەیەوێ با بۆلای پەروەردگاری ڕێگا بگرێتەبەر، واتە: هەمیشە ملکەچی بڕیارو فەرمانەکانی خوای خۆی بێت، تا لەو ڕۆژەدا ڕزگاری ببێ.

**هاتنی قیامەت زۆر نزیکە:**

﴿[٤٠] إنا انذرناکم عذابا قریبا﴾ بەڕاستیی ئێمە هەر زوو ئێوەمان ئاگادار کردووە -ئەی بێ بڕوایانی مەککە- کەسزایەکی نزیك بەڕێوەیە بۆتان ﴿یوم ینظر المرء ما قدمت یداە﴾ ئەو ڕۆژە ڕۆژێکە کە ئادەمیزاد سەیری دەسپێشکەری خۆی دەکات " لەچاك و لەخراپی" وەك دەفەرمووێ: (ووجدوا ماعملوا حاضرا..)١٨/٤٩. یان (وفصیلتە التی تؤویە..)٧٠/٣. ﴿ویقول الکافر یا لیتنی کنت ترابا﴾ ئەو دەمە کافرو بێ بڕوایش دەڵێت: ئای خۆزگە هەر خاك و خۆڵ بوومایە "نەك ئادەمیی، تا ئاوا زیندوو نەکرامایەتەوەو حیساب نەکرامایە".

سوپاس و پێزانین بۆ خوای گەورە لە سەر تەواو کردنی تەفسیری سوورەتی (نەبەء).

*** *** ***

## ٧٩- سوورەی ( نازیعات )ە
## مەککەییەو ( ٤٦ ) ئایەتە

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

ئەم سوورەتە وەك سوورەتە مەککەییەکانی تر باسی بناغەکانی بیرو باوەڕی ئیسلام دەکات: یەکتاپەرستیی، پەیام، زیندوو بوونەوە، پاداش و تۆڵە.. جا لەسەرەتاوە سوێند بەو فریشتانە ئەخوا کە زۆر بەئاسانیی و نەرمییەکەوە گیانی موسڵمانان ئەکێشن، وە زۆر بەسەختیی و توندییش گیانی پیسی خوانەناس و بێ بڕوایان لە جەستەیان دەرئەکەن، وە هەروا بەو فریشتانەش کە پیادە کردنی کاروباری زەوییان دراوەتە دەست: (والنازعات غرقا.. فالمدبرات أمرا)، ئینجا باسی ئەو هاوبەش پەیدا کەرانە ئەکات کە لەزیندووبوونەوە ململانێ و نکوڵی ئەکەن، دەرەنجامیش لە ترسی ئەو ڕۆژەدا دڵیان ئەکەوێتە گورپە گورپ: (قلوب یومئذ واجفة). پاشان باسی سەرکەش و یاخیی و لەخۆ بایی بووەکەی (میسر) (فیرعەون) دەکات، کە بەو پلەو ئەندازەیە داوای خوایەتی ئەکرد! جا خوای گەورەش ڕقی لێ هەڵساو، بەتوندی لێی تورە بوو و پشتی شکان.. (هل اتاك حدیث موسى إذ ناداە ربە بالواد المقدس طوى..). هەروەك باس لەسنوور دەرچووەکانی (مەککە) و سەر کۆنەکردنیان دەکات و پێیان دەفەرموێ: (أأنتم أشد خلقا أم السماء..؟!) لەدواییشدا باسی هاتنی ڕۆژی دوایی دەکات کە بەلای ئەوانەوە زۆر دوورە..! (یسألونك عن الساعة أیان مرساها..؟).

## خوا سوێند دەخوات بە پێنج شت قیامەت دێ:

﴿بسم الله الرحمن الرحیم* ١ والنازعات غرقا﴾ سوێند بەو فریشتانە کە بەتوندی گیانی بێ بڕوایان ئەکێشن ﴿٢ والناشطات نشطا﴾ وە سوێند بەو فریشتانەی کە زۆر بەئەسپایی و ئاسانی گیانی موسڵمانان ئەکێشن و بەچالاکیی و بێ وچان دەسووڕێنەوە بۆ ئەنجامدانی کارەکانیان ﴿٣ والسابحات سبحا﴾ وە سوێند بەو فریشتانەی وەك مەلەوان مەلە بکا, ئاوا بەخێراییلەئاسمان دادەبەزن بۆ ئەنجامدانی فەرمانەکانی خوا ﴿٤ فالسابقات سبقا﴾ ئینجا سوێند بەو فریشتانەی کە زۆر بەتوندی پێش برکێ دەکەن بە ئەرواح و گیانی موسڵمانەکان بۆ بەهەشت ﴿٥ فالمدبرات امرا﴾ جا بەو فریشتانەی کە بەویستی خوا زۆر بەوردی کارو فەرمانی بوونەوەر جێبەجێ دەکەن "سوێند بەم پێنج شتە قیامەت ڕاست و دروستە و لەپێشدایە و ئێوەش زیندوو ئەکرێنەوەو موحاسەبە ئەکرێن. هەندێ دەڵێن: مەبەست بەو پێنج شتە کە خوای گەورە سوێندی پێ خواردن ئەستێرەیە کە هەریەکەیان لە (مدار) و خولگەی دیاریکراوی خۆیدا دەسوڕێتەوەو کاری خۆی ئەنجام ئەدات.. هەندێکی تر تەفسیری تریان بۆ ئەکەنەوە.. جا خوای گەورە بۆیە بەو دووشتە سوێند ئەخوات و بەهەندێ لەدروستکراوەکانی تری خۆی:

الجزء الثلاثون — سورة النبإ

إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ مَفَازًا ﴿٣١﴾ حَدَآئِقَ وَأَعْنَٰبًا ﴿٣٢﴾ وَكَوَاعِبَ أَتْرَابًا ﴿٣٣﴾ وَكَأْسًا
دِهَاقًا ﴿٣٤﴾ لَّا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا كِذَّٰبًا ﴿٣٥﴾ جَزَآءً مِّن رَّبِّكَ عَطَآءً
حِسَابًا ﴿٣٦﴾ رَّبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ٱلرَّحْمَٰنِ لَا يَمْلِكُونَ
مِنْهُ خِطَابًا ﴿٣٧﴾ يَوْمَ يَقُومُ ٱلرُّوحُ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ صَفًّا لَّا يَتَكَلَّمُونَ
إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ وَقَالَ صَوَابًا ﴿٣٨﴾ ذَٰلِكَ ٱلْيَوْمُ ٱلْحَقُّ فَمَن
شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ مَـَٔابًا ﴿٣٩﴾ إِنَّآ أَنذَرْنَٰكُمْ عَذَابًا قَرِيبًا يَوْمَ
يَنظُرُ ٱلْمَرْءُ مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُ وَيَقُولُ ٱلْكَافِرُ يَٰلَيْتَنِى كُنتُ تُرَٰبًۢا ﴿٤٠﴾

سُورَةُ النَّازِعَاتِ — ترتيبها ٧٩ — آياتها ٤٦

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلنَّٰزِعَٰتِ غَرْقًا ﴿١﴾ وَٱلنَّٰشِطَٰتِ نَشْطًا ﴿٢﴾ وَٱلسَّٰبِحَٰتِ سَبْحًا
﴿٣﴾ فَٱلسَّٰبِقَٰتِ سَبْقًا ﴿٤﴾ فَٱلْمُدَبِّرَٰتِ أَمْرًا ﴿٥﴾ يَوْمَ تَرْجُفُ ٱلرَّاجِفَةُ
﴿٦﴾ تَتْبَعُهَا ٱلرَّادِفَةُ ﴿٧﴾ قُلُوبٌ يَوْمَئِذٍ وَاجِفَةٌ ﴿٨﴾ أَبْصَٰرُهَا
خَٰشِعَةٌ ﴿٩﴾ يَقُولُونَ أَءِنَّا لَمَرْدُودُونَ فِى ٱلْحَافِرَةِ ﴿١٠﴾ أَءِذَا كُنَّا
عِظَٰمًا نَّخِرَةً ﴿١١﴾ قَالُوا۟ تِلْكَ إِذًا كَرَّةٌ خَاسِرَةٌ ﴿١٢﴾ فَإِنَّمَا هِىَ زَجْرَةٌ
وَٰحِدَةٌ ﴿١٣﴾ فَإِذَا هُم بِٱلسَّاهِرَةِ ﴿١٤﴾ هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ ﴿١٥﴾

٥٨٣

یەکەم: ئەو شتانە وەك خۆرو مانگ و ئەستێرە، ئەوەندە گەورەو پیرۆز بوون لای خەڵکی: ئەیان پەرستن! (والشمس وضحاها..) ئینجا هەندێ شتیان بۆ باس ئەکات، وەك ئاوابوون و هەڵوەرینیان، کە ئەوە پەسن و سیفەتی خوایەتی نییە. تا لێیان دوور کەونەوە. دووەم: کاتێ کە مەردووم بچووك و بێ بایەخ تەماشای ئەوانە دەکات، جاخوا سوێندیان پێ ئەخوات بۆ ئەوەی لێیان ورد ببنەوە و پەندیان لێ وەرگرن ﴿٦ یوم ترجف الراجفة﴾ سوێند بەوانە هەموو، ڕۆژێك دێت زەویی بەتوندی تەکان دەداو دەکەوێتە لەرزە ﴿٧ تتبعها الرادفة﴾ ئاسمانیش دوای ئەو " لەت لەت ئەبێ و هەرچی ئەستێرەی لەخۆ گرتووە هەڵ ئەوەرێ، (ئیبن عەباس) دەڵێ: مەبەست بەو ڕۆژانە، ڕۆژی نەفخەی یەکەم و دووەمە، وەك لەسوورەتی دیکەدا ئەفەرموێ: (یوم ترجف الأرض والجبال..) ٧٣/١٤. ر٦٩/١٤). (موجاهید) دەڵێ: یەکەم بۆ یەکەمە، دووەمیش بۆ دووەم. ئیمامی (ترمیزی)یش ئەم فەرموودەیەی هێناوە: ((کان رسول الله ﷺ إذا ذهب ثلثا اللیل قام فقال: یاأیها الناس اذکروا الله، جاءت الراجفة تتبعها الرادفة جاء الموت بما فیه..)) واتە: پێغەمبەر ﷺ هەمیشە خووی وابوو هەر کەدوو سێیەمی شەو ڕۆشتبا هەڵدەساو ئەیفەرموو: ئەی خەڵکینە! هەردەم یادی خوا بکەن و بێ ئاگامەبن، لەرزەی یەکەم هات و، دووەمیش بەدوایدا دێ، وە هەروا مردن و قۆناغ و حاڵەتەکانیش دەگات ﴿٨ قلوب یومئذ واجفة﴾ لەو ڕۆژەدا گەلێ دڵ دەکەونە گورپە گورپ و لە ترسانا بەخێرایی لێدەدەن و ﴿٩ ابصارها خاشعة﴾ چاوی خاوەنی ئەودڵانە شۆڕەو

ڕوویان نیه سەر بەرز بکەنەوە ﴿١٠ یقولون إنا لمردودون فی الحافرة﴾ لە دنیادا دەیانگوت: ئایا دوای مردن جارێکی تر بۆ ژیانی پێشوو دەمانگێڕنەوە..؟! هەرگیز شتی وا نابێت و بڕوامان پێی نییە ﴿١١ إذا کنا عظاما نخرة﴾ ئایاکاتێ بووینە ئێسکە ڕزیوو پرتووکاین..؟! سەر لەنوێ زیندوو دەبینەوە..؟ ﴿١٢ قالوا تلك إذا کرة خاسرة﴾ بەگاڵتەوە دەیانگوت: ئەگەر ئەوە ڕاست بێت کە دەڵێن زیندوو بوونەوە هەیە، ئەو حەلە بۆ ئێمە گەرشانەوەیەکی بەزیان ، چونکە جێگەمان دۆزەخ دەبێت ﴿١٣ فإنماهی زجرة واحدة﴾ ئێوە ئەوە بەشتێکی گران مەزانن.. بەڕاستی بۆ ئێمە کارێکی زۆر ئاسانە، چونکە تەنها یەك شریخەیە, واتە: دەنگێکی سامناکەو، یەك جار فوو ئەکرێ بە شەیپوردا، ئیتر هەموو زیندوو ئەبنەوەو لەگۆڕ دێنە دەرێ ﴿١٤ فإذا هم بالساهرة﴾ ئەوسا لەناکاو ئەو خەڵکە هەر هەموویان لەدەشتێکی کاکی بەکاکیدا بێدارن وزیندووو ئامادەن، وەك ئەفەرمووێ: (یوم یدعوکم فتستجیبون بحمده وتظنون إن لبثتم إلا قلیلا)٥٢/١٧. یان (وما أمرنا إلا واحدة کلمح بالبصر)٥٤/٥٠. (وما أمر الساعة إلا کلمح البصر أو أقرب..)..٧٧/١٦. ئینجا بۆ دڵدانەوەی پێغەمبەرو هۆشیار کردنەوەی قورەیش داستانەکەی فیرعەون لەگەڵ (مووسا)دا ﷺ باس دەکا تا بەڵکو لەو یاخی بوون و سەرپێچییەیان دەست هەڵگرن.



### سەرگروشتەی مووسا ﷺ:

﴿١٥ هل اتاك حدیث موسی﴾ ئایا باس و هەواڵی مووسات، پێگەیشتووە..؟ ﴿١٦ إذ ناداه ربه بالواد المقدس طوی﴾ کاتێ کە پەروەردگاری لە دۆڵی پیرۆزی (طوی)دا کە لەخوارووی شاخی (سینا)دایە بانگی لێکرد ﴿١٧ إذهب إلی فرعون إنه طغی﴾ فەرمووی: بچۆ بۆلای فیرعەون (ئامۆژگاری بکە) چونکە بەڕاستی زۆر لەسنوور دەرچووەو یاخی بووە و گەلی بەنی یسرائیلیشی کردووە بە کۆیلە ﴿١٨ فقل هل لك إلی أن تزکی﴾ پێیشی بڵێ: ئایا ناتەوێ خۆت لەگوناح و تاوان پاك و پڕ،ختە بکەیتەوە..؟ ﴿١٩ وأهدیك إلی ربك فتخشی﴾ و ڕێنماییت بکەم بۆناسینی پەروەردگارت و، ترسی ئەوت ببێ و ستەم نەکەیت؟. واتە: بەڵکو دەرەنجام دابچڵەکێیت و بیر لەپاشەڕۆژی خۆت بکەیتەوە ﴿٢٠ فأراه الآیة الکبری﴾ بەڵێ مووسا ڕۆیشت، بەڵام هەرچەندە هەوڵی لەگەڵدا نەهاتە سەر ڕێی ڕاست، جا موعجیزەو نیشانە گەورەکەی نیشان دا , ئەوەبوو لەپێش چاویەوە داردەستەکەی بووە ئەژدیها" ﴿٢١ فکذب وعصی﴾ کەچی بەدرۆزنی داناو یاخیش بوو ﴿٢٢ ثم أدبر یسعی﴾ لەپاشان پشتی هەڵکردو هەمیشەش ئەکۆشا بۆ بەدرۆ خستنەوەی ﴿٢٣ فحشر فنادی﴾ بۆیە ئیتر هەموو "جادووگەرەکانی" کۆ کردەوەو هاواری خەڵکەکەی کرد ﴿٢٤ فقال انا ربکم الأعلی﴾ وتی: من پەروەردگاری بەرزو بڵوندی ئێوەم "من ئەوپەرسراوەم کەلەلای ژوورمەوە کەسی تر نییە..!! ﴿٢٥ فأخذه الله نکال الآخرة والأولی﴾ ئەوسا خوای گەورە دووچاری سزای هەردوو جیهانی کردو قاری لێگرت ﴿٢٦ إن فی ذلك

لعبرة لمن يخشى﴾ بێگومان ئا لەو بەسەرهاتەدا پەندو ئامۆژگارییەکی گرنگ هەیە بۆ هەرکەسێك بیەوێ لەخوا بترسێ " و فرمانەکانی ئەو بەجێ بێنێ، ئەگەر بیرێ بکاتەوە لەبەسەرهات و سەرەنجامی ئەو یاخیيە.. کە بەو هەموو تواناو دەسەڵاتەیەوە گیرۆدەبوو" ئەی هاوبەش پەیداکەران ئێوە چۆن ڕزگار دەبن..؟ هەزار رەحمەت لە (سەيید) چەند جوان دەڵێت: هەر خەفڵەتی جەماوەر بوو لەو سەردەمەدا فیرعەونیشی سەر لێشێوان کرد و فریویدا.. (بەڕاستی هیچ شتێك بە ئەندازەی خۆخافڵکردن و خۆ بێ ئاگایی کردنی جەماوەر، (طاغیة)ی زەمان یاخی ناکا.. چونکە ئەو کە دەبینێ هەرچی دەڵێ و هەرچی دەکا، هەر فرمانی بەجێيە.. ساتێ دەبینێ هەموان پشتیان بۆ دانواندووە، ئیتر زۆر بەئاسانی سواری پشتیان دەبێ، دیتی ملیان بۆ راکێشاوەو سەریان بۆ شۆڕ کردووە.. ئیتر ئەوانیش زیاتر زاڵ دەبن و، گەلیش عیززەتی خۆی لەدەست دەداو، ئەمیش یاخی تر ئەبێ و، ئەوانیش ڕیسواتر دەبن و لەئەنجامیشدا هەردوولاشیان تیا دەچن..!

## دروستکردنی ئاسمان وزەمین لە بەدیهێنانی مەردم دژوارترە:

دوای داستانەکەی موساو فیرعەون دەگەڕێتەوە سەر ئەوانەی کە نکووڵیی و ئینکاریی زیندوو بوونەوە یان دەکرد، تا هەندێ بەڵگەی تریان بۆ بێنێتەوە: ﴿[٢٧] أانتم اشد خلقا أم السماء بناها﴾ خەڵکینە! ئایا دروست کردنەوەو زیندوو کردنەوەی ئێوە دوای مەرگ سەخترو گرانترە، یا بەدیهێنانی ئەم ئاسمانە کە خوای گەورە بینای کردووە؟ لەکاتێکا ئێوەی لەئاوێکی قیزەوون و لاوازو بێ دەستەڵات بەدیهێناوە، ئاسمانیشی زۆر بە قایم و مەحکەم بەلای سەرووتانەوە راگرتووە، واتە: دروست کردنی ئاسمانەکان گرنگترە لەزیندوو کردنەوەی ئێوە، وەك ئەفەرموێ: (لخلق السموات والأرض أكبر من خلق الناس..)٥٧/٤٠ ﴿[٢٨] رفع سمكها فسواها﴾ بەرزی کردۆتەوە و پەیوەستی کردووە بەیەکەوە و جۆشی داون و بەتوندو تۆڵ بەستوونی بەیەکەوەو، بێ عەیب و نەنگ ڕێکی خستوون ﴿[٢٩] واغطش ليلها واخرج ضحاها﴾ و شەوەکەی تاریك کردووە، ڕۆژەکەشی ڕووناك دەرهێنا، واتە: شەوو ڕۆژتان بەدوای یەکدا بۆ دێنێ ﴿[٣٠] والأرض بعد ذلك دحاها﴾ دوای ئاسمانیش زەوی بەشێوەی هێلکەیی بەدیهێناوە بۆ نیشتەجێ بوون و حەوانەوەتان. واتە: دوای هەزاران هەزار ساڵ، یا سەدان ملیۆن ساڵ کە بەسەر زەوییدا تێ پەڕیی و، بەکەڵکی ژیان نەدەهات.. ئەوسا خوای گەورە زەویی ڕاخست و وای لێکرد کە گیانداری لەسەر بژی، ئەم ئایەتە وادەگەیەنێت کە زەویی بەر لە دروست کردنی ئاسمان بەدی هێنرا بێت، بەڵام بەهێلکەیی بوونی دوای دروستکردنی ئاسمان بووە. ﴿[٣١] اخرج منها ماءها ومرعاها﴾ ئاوو لەوەڕی لێ دەرهێناوە چەندین کانی وئاوو ڕووباری لێ هەڵقوڵاندووەو گژوگیاو لەوەڕی لێ سەوز کردووە ﴿[٣٢] والجبال ارساها﴾ کێوەکانیش زۆر بەتۆکمەیی چەسپاندو لەنگەری گرتن و بوونە بەمێخ بۆ دامرکاندنی زەویی و چەسپاندنی، تائێوە بەسەر پشتییەوە بژین ﴿[٣٣] متاعا لكم ولأنعامكم﴾ تا خۆتان و، ماڵات و ئاژەڵەکانتان بەهرەی لێ وەرگرن، تا ئەوکاتەی کۆتایی جیهان دێت.

## هەر خوا کاتی هاتنی ڕۆژی قیامەت دەزانێ:

﴿[٣٤] فإذا جاءت الطامة الكبرى﴾ ئینجا کاتێ ڕووداوە گەورەکە- ڕۆژی قیامەت - پێشهات کە بەڕاستی ڕووداوێکی زۆر گەورە و بێ وێنەیە، وەك دەفەرموێ: (والساعة ادهى وامر)٥٤/٤٧. ﴿[٣٥] يوم يتذكر الإنسان ماسعى﴾ ئەوە ڕۆژێکە ئادەمیی کردەوەی خۆی دێتەوەیاد، بەڵام چ کەڵکێکی دەبێ" وەك دەفەرموێ: (يومئذ يتذكر الإنسان وانى له الذكرى)٨٩/٢٣. ﴿[٣٦] وبرزت الجحيم لمن يرى﴾ ودۆزەخ نیشان دەدرێت بۆ ئەوەی ئەیبینێ، واتە:

بەچاوی سەر هەموو کەسێك دۆزەخ دەبینێ.. جا ئەو حەلە ئادەمی ئەبێتە دوو بەش: ﴿٣٧ فأما من طغى﴾ جا ئەوەی خوانەناس و یاخیبووبێ و سنووری بەزاندبێ ﴿٣٨ وآثر الحياة الدنيا﴾ و ژیانی ئەم دونیایەی هەڵبژاردبێ بەسەر ئەو دونیادا ﴿٣٩ فإن الجحيم هى المأوى﴾ ئەوە بێ گومان دۆزەخ جێگەی مانەوەیەتی ﴿٤٠ وأما من خاف مقام ربه﴾ بەڵام ئەوکەسەی لە گەورەیی و دەسەڵاتی پەروەردگاری خۆی ترسابێت ﴿ونهى النفس عن الهوى﴾ و جڵەوی نەفسی لە هەواو ئارەزوو گرتبێتەوە ﴿٤١ فإن الجنة هي المأوى﴾ جا ئەوە بێگومان بەهەشتە جێی مانەوەو حەوانەوەی ﴿٤٢ يسألونك عن الساعة أيان مرساها﴾ لەبابەت ڕۆژی قیامەتەوە: لێت دەپرسن کە چ کاتێ روو ئەدا؟ ﴿٤٣ فيم انت من ذكراها﴾ جا تۆ چیتە لە باسکردنی ئەو ڕۆژە؟ واتە: تۆ هیچی لێ نازانیت، ئیتر ئەوانە بۆ ئەوەندە تەنگاون، ئەکەن..؟

خاتوو (عائیشە) -خوای لێ رازی بێ- دەڵێ: پەیامبەر پەیتاپەیتا لێیان دەپرسی: قیامەت کەی دێ..؟ تا ئایەتی: ﴿فيم انت من ذكراها﴾ هات (ئیبن جریر، حاکم) ئەوەیان گێڕاوەتەوە. ﴿٤٤ إلى ربك منتهاها﴾ سەرەنجام و کۆتایی دونیا تەنها لای پەروەردگارتە , واتە:هەر خواوەندت کاتەکەی دەزانێ وەك دەفەرموێ: (قل إنما علمها عند الله)١٨٧/٧. ﴿٤٥ إنما انت منذر من يخشاها﴾ ئەرکی تۆ تەنها بێدارکردنەوەو ترساندنی ئەوانەیە لەو ڕۆژە دەترسن و خۆیانی بۆ ئامادە دەکەن، ئیتر دیاریکردنی کاتەکەی بەتۆی نەسپاردراوە.. بۆیە پێغەمبەریش ﷺ کاتێ کە (جبریل) لەکاتی هاتنی ڕۆژی قیامەت لێی دەپرسی، دەفەرموێ: ((ما المسؤل عنها بأعلم من السائل)) فتح الباری:١/١٤٠. واتە: منی لێپرسراو لە تۆی پرسیارکەر زاناتر نیم ,جا کەوابوو تۆ کارەکەی خۆت ئەنجام بدەو خۆت بەشتێکەوە سەر گەرم مەکە کاری تۆ نەبێت ﴿٤٦ كأنهم يوم يرونها﴾ ئەو ڕۆژە کەئەوانە قیامەت دەبینن ﴿لم يلبثوا الا عشية او ضحاها﴾ وائەزانن لەدونیادا تەنها ئێوارەیەك یا چێشتنگایەك ماونەتەوە، واتە: لەبەر درێژی وسەختیی و گرانی ئەو ڕۆژەیە، ماوەی ژیانی دونیایان بەلاوە زۆر کەم دەبێ، چەندین بەڵگەش بۆراستی وحەقیقەتی ئەم زیندوبوونەوەیە هەیە، جا بۆ نموونە: بەسەرهاتەکەی (عوزەیر) و خەوە درێژەکەی یارانی ئەشکەوتەکە، کە پاش زیندوو بوونەوەو بێدار بوونەوە وتیان: یان ڕۆژێکە لێرەین، یان کەمتر لە ڕۆژێك!!

تەفسیری سوورەتی (نازیعات) تەواو بوو لەگەڵ سوپاسی زۆردا بۆ خوای کارزان.

*** *** ***

## ٨٠ - سوورەتی (عەبەس)ـە
## مەککەییەو (٤٢) ئایەتە

### بەناوی خوای دەهندەی دلۆڤان

ئەم سوورەتی (عەبەس)ـە باسی بیروباوەڕە بناغەییەکان دەکات.. هەروەك باسی دەسەڵات و توانایی خوای گەورە وەبیردێنێتەوە لە دیاردەی دروستکردنی ئادەمیی و ڕووەك و، خۆراك و.. هتد، لەگەڵ قورسیی و سەختیی ڕۆژی دوایی.

### پێغەمبەرلە هاتنی بێچاوەکە گرژ بوو، خواش گلەیی لێکرد:

لەسەرەتاوە بەداستانەکەی (عەبدوڵڵای کوڕی ئوم مەکتووم خوا لێی رازی بێ) دەست پێدەکات، ئەوکاتە کە هاتە لای پەیامبەر ﷺ و داوای لێکرد کە پتر لە ئایینی پیرۆزی ئیسلام شارەزای بکات، لەو دەمەدا ئەویش لەگەڵ سەرانی قورەیشدا دانیشتنی هەبوو، زۆریش دڵخۆش بوو بە دانیشتنەکە لەگەڵیاندا، بەو مەبەستە بەشکو بتوانێ

تینیان تێ بکا و وردە وردە بەرەو ئیسلام بیانهێنێ، جا لەو حەلەدا (عەبدوڵڵا)ش پەیتا پەیتا قسەکانی پێ ئەبڕیی و ئەیوت: شارەزام بکە لەئیسلام، پەیامبەر ﷺ بەناچاری رووی لێگرژ کردو لێی بێتاقەت بوو! ئیتر خوای گەورەش سوورەتی (عبس)ـەی ناردە خوارێ، وەك ئیمامی (ترمیزیی) ریوایەتی کردووە ٢٥٠/٩. پاشان لەنکوولیی و، ململانێی مرۆڤ لەگەڵ دەسەڵاتی پەروەردگاردا دەدوێ: (قتل الإنسان ماأكفره.. ثم السبيل يسره). دیسانەوە شتێك لەدەسەڵاتی خوا دەخاتە ڕوو، کە لەم بوونەوەرەدا چۆن ڕێگەی ژیانی بۆ ئادەمی ئاسان کردووە.. (فلينظر الإنسان إلى طعامه.. وزيتونا ونخلا.. متاعا لكم ولأنعامكم)، کورتە باسێکی سامناکیی رۆژی دوایی وپەسڵان دێنێتە پێش چاو، تا بەڵکو مرۆڤەکان پێش هاتنی ئەو رۆژە وشیار وبەئاگا ببنەوە.. (فإذا جاءت الصاخة.. أولئك هم الكفرة الفجرة).وە بەم شێوەیەش دەست پێدەکا:

﴿بسم الله الرحمن الرحيم * [١] عبس وتولى * [٢] ان جاءه الأعمى﴾ پەیامبەر ﷺ روویگرژ کردو، روویسوڕاند لەوە کە ئیماندارە نابینا کە هاتە لای. بەڵێ.. ئیتر پەیامبەر ﷺ پاش ئەوە هەرکات بەعەبدوڵڵا گەیشتبا ئەیفەرموو: (مرحبا بمن عاتبني فيه ربي). واتە: مەرحەبا لەوکەسەی پەروەردگارم لە سەر ئەو گلەیی لێکردم، وە یا خوا هەر بەخۆشیی وشادی بژی. ﴿[٣] وما يدريك لعله يزكى﴾ جا تۆ چوزانیت بەڵکو ئەو بیبەوێ زیاتر دڵ ودەروونی خۆی پاك بکاتەوە لە گوناح و تاوان، بۆیە ئەوەندە سوورەو حەز ئەکات کە زیاتر شارەزا ببێ ﴿[٤] او يذكر فتنفعه الذكرى﴾ یاخود ئامۆژگاری وەر بگرێ،بەو وتانە لەتۆی ئەبیسێ، ئەوجا ئەو ئامۆژگاریە سوودی پێبگەیەنێت ﴿[٥] اما من إستغنى * [٦] فأنت له تصدى﴾ کەچی ئەو کەسەی کە گوێی لەئامۆژگاری نیەو، خۆی بێ نیاز نیشان دەدات، تۆ ڕوولەو ئەکەیت و گوێ بۆ قسەکانی دەگریت..! ﴿[٧] وما عليك الا يزكى﴾ وە تۆ هیچت لەسەر نیە ئەو خۆی پاك نەکاتەوەو بڕوا نەهێنێت، چونکە ئەرکی تۆ تەنها ڕاگەیاندنە ﴿[٨] واما من جاءك يسعى﴾ بەڵام ئەوەی بەپەلە هاتۆتەلات و دەیەوێت شارەزای دین ببێت ﴿[٩] وهو يخشى﴾ ولەهەمانکاتیشدا لەخوا دەترسێت ﴿[١٠] فأنت عنه تلهى﴾ تۆ خۆت خافڵ و سەرگەرم ئەکەیت لێی و گوێی نادەیتێ! ﴿[١١] كلا إنها تذكرة﴾ نەخێر، جارێکی تر وانەکەیت وە بەراستیئەو ئایەتانەش لەم سوورەتەدان -هەموویان- یادخستنەوەو ئامۆژگاریین بۆ هەموو مرۆڤەکان بەگشتیی، کەوابوو دەبێ هەموان بێ جیاوازیی سوودی لێوەرگرن.

تێبینی: ڕاڤەکارانی قورئان دەڵێن: (والوقوف على ((كلا)) على هذا الوجه جائز، ويجوز أن تقف على (تلهى) ثم ((كلا)) على معنى حقا) ﴿[١٢] فمن شاء ذكره﴾ جائەوەی ویستی ئامۆژگاری لێ وەر دەگرێت, واتە: هیچ ڕێگرییەك لەبەردەم ئادەمییدا بۆئەوە نیە، مەگەر خۆی هەڵە بکات ﴿[١٣] في صحف مكرمة﴾ ئەو ئایەتانە لە چەندین لاپەڕەی

الجزء الثلاثون — سورة عبس

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ (١) أَن جَآءَهُ ٱلۡأَعۡمَىٰ (٢) وَمَا يُدۡرِيكَ لَعَلَّهُۥ يَزَّكَّىٰٓ (٣) أَوۡ
يَذَّكَّرُ فَتَنفَعَهُ ٱلذِّكۡرَىٰٓ (٤) أَمَّا مَنِ ٱسۡتَغۡنَىٰ (٥) فَأَنتَ لَهُۥ تَصَدَّىٰ (٦)
وَمَا عَلَيۡكَ أَلَّا يَزَّكَّىٰ (٧) وَأَمَّا مَن جَآءَكَ يَسۡعَىٰ (٨) وَهُوَ يَخۡشَىٰ (٩) فَأَنتَ
عَنۡهُ تَلَهَّىٰ (١٠) كَلَّآ إِنَّهَا تَذۡكِرَةٞ (١١) فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ (١٢) فِي صُحُفٖ مُّكَرَّمَةٖ
(١٣) مَّرۡفُوعَةٖ مُّطَهَّرَةِۭ (١٤) بِأَيۡدِي سَفَرَةٖ (١٥) كِرَامِۭ بَرَرَةٖ (١٦) قُتِلَ ٱلۡإِنسَٰنُ
مَآ أَكۡفَرَهُۥ (١٧) مِنۡ أَيِّ شَيۡءٍ خَلَقَهُۥ (١٨) مِن نُّطۡفَةٍ خَلَقَهُۥ فَقَدَّرَهُۥ (١٩) ثُمَّ
ٱلسَّبِيلَ يَسَّرَهُۥ (٢٠) ثُمَّ أَمَاتَهُۥ فَأَقۡبَرَهُۥ (٢١) ثُمَّ إِذَا شَآءَ أَنشَرَهُۥ (٢٢) كَلَّا لَمَّا
يَقۡضِ مَآ أَمَرَهُۥ (٢٣) فَلۡيَنظُرِ ٱلۡإِنسَٰنُ إِلَىٰ طَعَامِهِۦٓ (٢٤) أَنَّا صَبَبۡنَا ٱلۡمَآءَ صَبّٗا
(٢٥) ثُمَّ شَقَقۡنَا ٱلۡأَرۡضَ شَقّٗا (٢٦) فَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا حَبّٗا (٢٧) وَعِنَبٗا وَقَضۡبٗا (٢٨)
وَزَيۡتُونٗا وَنَخۡلٗا (٢٩) وَحَدَآئِقَ غُلۡبٗا (٣٠) وَفَٰكِهَةٗ وَأَبّٗا (٣١) مَّتَٰعٗا لَّكُمۡ
وَلِأَنۡعَٰمِكُمۡ (٣٢) فَإِذَا جَآءَتِ ٱلصَّآخَّةُ (٣٣) يَوۡمَ يَفِرُّ ٱلۡمَرۡءُ مِنۡ أَخِيهِ (٣٤)
وَأُمِّهِۦ وَأَبِيهِ (٣٥) وَصَٰحِبَتِهِۦ وَبَنِيهِ (٣٦) لِكُلِّ ٱمۡرِيٕٖ مِّنۡهُمۡ يَوۡمَئِذٖ شَأۡنٞ
يُغۡنِيهِ (٣٧) وُجُوهٞ يَوۡمَئِذٖ مُّسۡفِرَةٞ (٣٨) ضَاحِكَةٞ مُّسۡتَبۡشِرَةٞ (٣٩) وَوُجُوهٞ
يَوۡمَئِذٍ عَلَيۡهَا غَبَرَةٞ (٤٠) تَرۡهَقُهَا قَتَرَةٌ (٤١) أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَفَرَةُ ٱلۡفَجَرَةُ (٤٢)

٥٨٥

پیرۆزدا هەڵگیراون، لە (لەوحولمحفوز) دا ﴿[١٤] مرفوعة مطهرة﴾ بەرزو بڵوندو پاك و خاوێنن ﴿[١٥] بأيدي سفرة﴾ بەدەستی فریشتەی باڵێۆزو نوێنەری شارەزا گەیەنراون ﴿[١٦] كرام بررة﴾ بەڕێزو پلە بەرزو فەرمانبەردارن، واتە: ئەو ئامۆژگارییانە -کە پەیامبەران ئەیکەن- لەنامەیەکی بەرزی، بڵوندی، پاك لەهەر ناتەواوییەك، وە لەدەست ئەو فریشتانەوە وەری دەگرن کە وەحیی و سروش دێنن بۆلایان، بۆیە پەیامبەر ﷺ دەربارەی قورئان خوێندنەکان ئەفەرموێ: ((الذي يقرأ القرآن وهو ماهر به، مع السفرة الكرام البررة، و الذي يقرؤه – وهو عليه شاق- له أجران)).أخرجه الجماعة. مسلم: ١/٥٤٩،فتح:٨/٥٦٠.

**ئەو ئینسانە بە کوش چیٚ وا باوەڕ بە زیندووبوونەوە ناکا:**

خوای کارجوان دەچێ بەگژ ئەوانەدا کە حاشاو نکوولی دەکەن دەربارەی زیندوبوونەوە هەڵسانەوە لەگۆڕ، بۆیە دەفەرموێ:﴿[١٧] قتل الإنسان ما أكفره﴾ ئادەمزاد بەکوشتچێت چەندە ناسوپاس و سپڵە یە،پاش ئەو هەموو نازو نیعمەت و بەهرانە کەخوای گەورە پێیداویت، کەچی هێشتا چەلەحانێ و ململانێ دەکەیت ﴿[١٨] من أي شئ خلقه﴾ بۆ بیر ناکاتەوە:بزانێ خوا لەچی دروستی کردووە..؟! ﴿[١٩] من نطفة خلقه فقدره﴾ لەدڵۆپە ئاوێکی هەڵقوڵاو دروستیکردووە، جا ئەندازەی گرتووەو بەچەند قۆناغێکا تێیپەڕاندوو و ڕێکیخست، بەڵێ لە منداڵداندا دڵۆپە ئاوێك بوو، جا بووە خوێنپارە، ئەوسا کردییە گۆشت پارە و ئەندازە گیریەکی وردی کردوو هێنایە دونیاوە ﴿[٢٠] ثم السبيل يسره﴾ لەوەودوا ڕێگەی بۆ خۆش و ئاسان کرد " تا لەسکی دایکی بێتە دەرەوە" وەك (ئیبن عەباس) دەڵێ: ئەگەرچی (موجاهید) دەڵێ: ئەم (ثم السبيل يسره) وەك ئایەتی: (إنا هديناه السبيل إما شاكراً وإما كفوراً) وایە، واتە: سەر پشکی هەردوو ڕێگاکەی کرد ﴿[٢١] ثم أماته فأقبره﴾ پاشان دەیمرێنێت و، بەفەرمانی خۆی لەگۆڕی دەنێت " لەبەر ڕێزلێنان و لەبەرئەوە کە دڕندەو شتی وا نەیخوات.. ﴿[٢٢] ثم إذا شاء أنشره﴾ پاشان کاتێك بییەوێ - دوای مردنی- زیندووی ئەکاتەوە ﴿[٢٣] كلا لما يقض ما أمره﴾ نا هێشتا ئەوەی خوا فەرمانی پێکردووە زۆربەی ئادەمزاد جێبەجێی نەکردووە!﴿[٢٤] فلينظر الإنسان إلى طعامه﴾ دەبا ئادەمزاد سەیرێکی خواردنەکەی خۆی بکا و سەرنجی بداو، بزانێ خوای گەورە چۆنی بۆ بۆ دەرهێناوە لەزەویەکی ڕەق وتەق؟ ﴿[٢٥] انا صببنا الماء صبا﴾ بێگومان ئێمە لەهەورەوە بارانێکمان بۆ ڕژاندۆتە خوارەوە بە چ ڕژاندنێك ﴿[٢٦] ثم شققنا الأرض شقا﴾ لەوەودوا زەویمان لەت لەت و قاژ قاژ کردووە، بە چ لەتکردنێك واتە: درزمان تێکردو، قڵیشانمان تا گیاو ڕووەکە ناسکەکان بەئاسانی بێنە دەرێ ﴿[٢٧] فأنبتنا فيها حبا﴾ جا ڕواندمان لە ناویدا جۆرەها دانەوێڵە ﴿[٢٨] وعنبا وقضبا﴾ و جۆرەها ترێ و، جۆرەها وێنجەو سەوزەوات ﴿[٢٩] وزيتونا ونخلا﴾ وداره زەیتوون و دارە خورماش , واتە: زەیت و هەموو جۆرە خورمایەکمان لێ بەرهەم هێنا ﴿[٣٠] وحدائق غلبا﴾ وە چەندین باخاتی گەورەو چڕو پڕ ﴿[٣١] وفاكهة وأبا﴾ وە میوەی جۆراو جۆروو گژو گیا. (ئیبن کەسیر) دەڵێ: ڕۆژێ (عومەری کوڕی خەتتاب) سوورەتی (عبس..)ەی دەخوێندەوە، تا گەیشتە (وفاكهة وأبا) ئەوجا وتی: دەزانم (فاكهة) چیە، بەڵام ئاخۆ (أب) چی بێ؟ پاشان هەر خۆی وتی: ئەی کوڕی خەتاب! جا ئەو زۆر لەخۆکردنەی بۆ چییە کەتۆ نەزانیت چیە؟! ﴿[٣٢] متاعا لكم ولأنعامكم﴾ ئەوانەمان هەموو سەوزکردو ڕواند، بە کەڵك بۆ خۆتان و ماڵاتەکەتان،، ئیتر حەقوایە ئینسان کوێرانە بەسەر ئەو هەموو شتانەدا نەڕواو، بیکاتە بەڵگەو نیشانەی زیندووبوونەوە لەگۆڕدا..!

### قیامەت هات برا لە برا رادەکات:

﴿٣٣ فإذا جاءت الصاخة﴾ ئینجا کاتێ شریخەکە هات , واتە: رۆژی قیامەت بەرپابوو ئەو شریخەیەش ئەوەندە قورسە گوێ کەڕ کیدەکاتەوە ﴿٣٤ یوم یفر المرء من اخیه * ٣٥ وامه وابیه *٣٦ وصاحبته وبنیه﴾ لەو رۆژەدا برا لەبرای خۆی رەوە لەدایك و باوکیی و لەژنی و، لە کوڕەکانی رادەکا ﴿٣٧ لکل امریء منهم یومئذ شأن یغنیه﴾ چونکە هەرکەسێك لێیان سەرگەرمی کارو کێشەی خۆیەتی و نای پەردەژێتە سەر ئەوی تر تەنانەت پەیامبەرانیش -سلاوی خوایان لێبێ- هەریەکەیان دەڵێ (نفسی، نفسی - خۆم، خۆم). لەبارەی تکاو شەفاعەتیشەوە ئەم ریوایەتە هاتووە: کە تەنانەت عیسای کوری مەریەمیش ﷺ دەڵێ: تەنها بۆ خۆم هاناو هاوار ئەبەم و دەلاڵێمەوە، دایکیشم کە منی لێبووە، ناتوانم تکای بۆ بکەم! (ئیبن عەباس) دەڵێ: پەیامبەر ﷺ فەرمووی: ((تحْشَرُونَ حُفاةً عُراةً مشاةً غُرْلا)) واتە: ئێوە - لە رۆژی قیامەتا- هەموو کۆ دەکرێنەوەو حەشر دەکرێن، بێ هیچ پێڵاوو کالایەك، وە بەپیادەو، بەخەتەنە نەکراوەیی هەروەك ئەو رۆژە کە لەدایك بوون. جا دەڵێ: یەکێ لە خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پەیامبەر! جا وادەبێت کە سەیری (عەورەت)ی یەکتر بکەین؟! ئەویش فەرمووی: (لکل امریء منهم یومئذ شأن یغنیه).أخرجه إبن أبي حاتم ﴿٣٨ وجوه یومئذ مسفرة﴾ لەو رۆژەدا رۆخسارەلێك دەدرەوشێتەوە, واتە: ئادەمزاد دەبنە دوو بەشەوە: هەیانە دەم و چاوو روخسارێکی گەش و جوان و رۆشن و هەردەم لەخۆشیدان ,چونکە بەرهەمی کارە چاکەکانیان هاتۆتەوە رێیان ﴿٣٩ ضاحکة مستبشرة﴾ پێدەکەنن و، مژدە بەخشن و شادومانن ﴿٤٠ ووجوه یومئذ علیها غبرة﴾ روخسارانێکیش لەو رۆژەدا تۆزیان بە سەرەوەیە , خەفەت بارو گرژو تاڵ و تۆزاویین , تەپ وتۆز دایگرتوون، رۆشناییان تیانەماوە ﴿٤١ ترهقها قترة﴾ دێزی و رەشیی وزەلیلی دایادەپۆشێ روویان رەش بووە لەفەرموودەیەکدا هاتووە: (یلجم الکافر العرق ثم تقع الغبرة علی وجوههم..)، ئیبن ئەبی حاتەم. واتە: - لەبەر گەرمای ئەو رۆژە - کافرەکان ئارەق دایاندەپۆشێ تائاستی دەمیان لەنێو قوردا دەچەقێن، لەپاشان تۆزو خەفەت لەروویان دەنیشێ ﴿٤٢ اولئك هم الکفرة الفجرة﴾ ئائەوانە بێبڕواو خوانەناس و لەسنوور دەرچوو گوناهکارەکانی دونیان.. وا ئێستایش ئەوقەی ئەو جۆرە سزایە دەبن.

کۆتایی تەفسیری سوورەتی (عەبەس)ـە هات لەگەڵ سوپاس و پێزانینی زۆرم بۆ پەروەردگار.

*** *** ***

## ٨١- سوورەتی ( تەکویر )ـە

## مەککەییەو ( ٢٩ ) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتە دووشتی زۆرگرنگ باس ئەکات: (نیگاو سروش، بەرنامەو پەیام) کە بەراستی هەردووکیان بەشێکی بەبەهاو بایەخدارن لە ئیمان وباوەڕدا، بۆیەکەمجار باسی قیامەت دەکا، ئەو ئاڵوگۆڕو تەقینەوە گەورەیە کە لەبوونەوەردا روودەدات: خۆرو، ئەستێرەکان، چیاو کێوەکان، زەریاو دەریاکان، زەویی، ئاسمان، ئاژەڵ و مەڕومالات، گیانلەبەرە کەژییەکان، هەروەك هەموو ئادەمیی و بوونەوەر زۆر بەتوندی دادچڵەکێنێ و دەیانخاتە لەرزە. پاشانیش بنەماو حەقیقەتی سروش و، ئەو باروحاڵەتە سەختەیە کە هەمووجار پەیامبەری خوای لەسەر بوو ﷺ کاتێ نیگای بۆ دەهات.. دەخاتە ڕوو, کۆتایشی دێت بەباسکردنی بێهوودەیی و پووچەڵکردنەوەی دوو دڵیی و، بەدگومانی هاوبەش پەیداکەرەکان دەربارەی قورئان: (فأین تذهبون.. وما تشاءون إلا أن یشاء الله رب العالمین).

**کەقیامەت دێ , هەموو کەس دەزانێ چی لەگەڵ خۆی بردووە:**

﴿بسم الله الرحمن الرحيم * [١] إذا الشمس كورت﴾ کاتێ خۆر پێچرایەوەوتاریك بوو و، واتە: رووناکی نەماو، لەشوێنی خۆی ترازا، وەك ئیمامی (بوخاری) ئەم فەرموودەیە دێنێ: ((الشمس والقمر يكوران يوم القيامة)). فتح: ٣٤٣/٦. واتە: ئەم خۆرو مانگەی ئیستایە هەردوو لەرۆژی بەرێدا تاریك دەبن و دەپێچرێنەوە ﴿[٢] وإذا النجوم انكدرت﴾ وەدەمێك ئەستێرەکان هەڵوەرین و، لەجێگەی خۆیاندا ترازان و کەوتنە خوارێ ﴿[٣] وإذا الجبال سيرت﴾ ودەمێك کێوەکان خرانە بزووتن و لەرزەو، بوونە گەردو نیشتنە ئاسمان ﴿[٤] وإذا العشار عطلت﴾ ئەو حەلەی وشترە ئاوسەکان بەرەڵڵا کران و پشتگوێ خران لێیان نەپرسرایەوە، یان کاتێ هەورەکان لەباران بارین خران ﴿[٥] وإذا الوحوش حشرت﴾ وکاتێ گیانلەبەرانی کێویی کۆکرانەوە ,پاش ئەوە کە لەترسی یەکتر نەیان ئەوێرا بەیەکەوە بژین، چونکە ئەو رۆژە ئەوەندە سەختە ئەوانیش خۆیان لەبیر ئەچێتەوە و دوژمنایەتیان نامێنێ، ئایەتی (وما من دابة فی الأرض ولا طائر يطير بجناحيه إلا أمم أمثالكم ما فرطنا فی الكتاب من شئ ثم إلى ربهم يحشرون)٣٨/٦. ئەو ڕاستیە دەگەیەنێت ﴿[٦] وإذا البحار سجرت﴾ وکاتێ دەریاکان تەقێنرانەوەو گڕدران لەئاگرو هەڵگیرسان و هەموو بوونە یەکپارچە ئاگر، ئەشگونجێت زەویی لەت لەت ببێ و هەرچی ئاگر لەناویایەتی دەرکەوێ و، هەرچی ئاوی دەریاکان هەیە، ببێتە هەڵم و گڕی تێ بەربێ و بچێ بەحەوادا، وەك دەیان جار کێوەکان بەهۆی زەمین لەرزە و تەقینەوەوە لەت و پەت بوون، لە (سوونەنی ئەبوداود)یشدا هاتووە: (لايركب البحر الا حاج أو معمر أو غاز، فإن تحت البحر نارا، وتحت النار بحرا) واتە: لەبەر ترسناکیی و سامناکی زەریاکان هەقە جگە لە حاجی و عومرەکەری (ماڵی خوا) و، موجاهیدی ڕێگەی خوا ,هیچ کەسێکی تر بە دەریاکاندا نەچێت، چونکە ژێری دەریاکان ئاگرە، وەژێر ئاگرەکەیش دەریایە!. ﴿[٧] وإذا النفوس زوجت﴾ وکاتێ هەموو گیانەکان جووتکرانەوە لەگەڵ لاشەی خۆیاندا ,واتە: کرانەوە بەجەستەی خۆیانداو هەمو گەڕانەوە بۆ حیساب و لێ پرسینەوە , وەك دەفەرموێ: (أحشروا الذين ظلموا وأزواجهم وما كانوا يعبدون)٢٢/٣٧. ﴿[٨] وإذا الموءودة سئلت﴾ وکاتێ کیژی زیندە بەچاڵکراو پرسیاری لێکرا ﴿[٩] بأی ذنب قتلت﴾ بەهۆی چ تاوانێکەوە کوژرا..؟!. هێشتا لەسەرەتای هاتنی ئیسلامیشەوە کچان لەلایەن ئەوانەوە کە بڕوایان نەهێنابوو هەر زیندە بەچاڵ ئەکران، تەنها بەتاوانی ئەوە کەبۆچی کچن.!! (قەیس) هاتە لای پێغەمبەر ﷺ وتی: من لەسەر دەمی جاهیلیەتدا کچانی خۆمم زیندە بەچاڵ دەکرد، دەبێ چ بکەم ئەی پێغەمبەری خوا! فەرمووی: بچوڵەباتی هەریەکەیان بەندەیەك ئازاد بکە، وتی: ئاخر من وشتر دارم! فەرمووی: دەبڕۆ لەباتی هەریەکەیان وشترێك سەر ببڕە. عبدالرزاق:٣٥١/٣. ﴿[١٠] وإذا الصحف نشرت﴾ دەمێك نامەو

الجزء الثلاثون　　سورة التكوير

سورة التكوير　آياتها ٢٩　ترتيبها ٨١

بسم الله الرحمن الرحيم

إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ (١) وَإِذَا النُّجُومُ انكَدَرَتْ (٢) وَإِذَا الْجِبَالُ
سُيِّرَتْ (٣) وَإِذَا الْعِشَارُ عُطِّلَتْ (٤) وَإِذَا الْوُحُوشُ حُشِرَتْ
(٥) وَإِذَا الْبِحَارُ سُجِّرَتْ (٦) وَإِذَا النُّفُوسُ زُوِّجَتْ (٧) وَإِذَا
الْمَوْءُودَةُ سُئِلَتْ (٨) بِأَيِّ ذَنبٍ قُتِلَتْ (٩) وَإِذَا الصُّحُفُ نُشِرَتْ
(١٠) وَإِذَا السَّمَاءُ كُشِطَتْ (١١) وَإِذَا الْجَحِيمُ سُعِّرَتْ (١٢) وَإِذَا الْجَنَّةُ
أُزْلِفَتْ (١٣) عَلِمَتْ نَفْسٌ مَّا أَحْضَرَتْ (١٤) فَلَا أُقْسِمُ بِالْخُنَّسِ (١٥)
الْجَوَارِ الْكُنَّسِ (١٦) وَاللَّيْلِ إِذَا عَسْعَسَ (١٧) وَالصُّبْحِ إِذَا تَنَفَّسَ (١٨)
إِنَّهُ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ (١٩) ذِي قُوَّةٍ عِندَ ذِي الْعَرْشِ مَكِينٍ (٢٠) مُّطَاعٍ
ثَمَّ أَمِينٍ (٢١) وَمَا صَاحِبُكُم بِمَجْنُونٍ (٢٢) وَلَقَدْ رَآهُ بِالْأُفُقِ الْمُبِينِ
(٢٣) وَمَا هُوَ عَلَى الْغَيْبِ بِضَنِينٍ (٢٤) وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَيْطَانٍ رَّجِيمٍ (٢٥)
فَأَيْنَ تَذْهَبُونَ (٢٦) إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ (٢٧) لِمَن شَاءَ مِنكُمْ أَن
يَسْتَقِيمَ (٢٨) وَمَا تَشَاءُونَ إِلَّا أَن يَشَاءَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ (٢٩)

سورة الانفطار　آياتها ١٩　ترتيبها ٨٢

٥٨٦　إذا السماء

پەراوەكانی كردەوەكان والا كران بۆ لێكۆڵینەوەو پاداش و تۆڵە ﴿١١ وإذا السماء كشطت﴾ و كاتێ ئاسمان لەجێگەی خۆیدا ترازاو داماڵرا, وەك پێستەی مەڕ, لەمەڕ دەكرێتەوە, واتە: سەرو خواری نەما ﴿١٢ وإذا الجحیم سعرت﴾ كاتێ كە دۆزەخ داگیرسێنراو كەوتە كڵپە كڵپ ﴿١٣ وإذا الجنة ازلفت﴾ كاتێ كە بەهەشت نزیك خرایەوە لەبەهەشتیەكانەوەو ئامادەكرا بۆیان ﴿١٤ علمت نفس ما احضرت﴾ كاتێ ئەوانە هەموو روویاندا, ئیتر ئەو دەمە هەموو كەسێك ئەزانێ چی ئامادەكردووە بۆ پاشە رۆژی خۆی، چاك یان خراپ, وەك ئەفەرمووێ: ((یوم تجد كل نفس ماعملت من خیر محضرا وماعملت من سوء تود لو أن بینها وبینه أمدا بعیدا))٣٠/٣ ﴿١٥ فلا اقسم بالخنس﴾ جاسوێند بەو ئەستێرانەی پەنا دەگرن بەرۆژداو بەشەودا دەر ئەكەون، وەك (تەبەریی) دەڵێ. ﴿١٦ الجوار الكنس﴾ ئەوانەی گەڕۆكن و لە گەڵ خۆردا دەڕۆن , وەبە رۆژدا خۆیان دەشارنەوە لە رووناكی خۆردا، وەك ئاسك لە جێگای پەناگای خۆیدا، خۆی ئەشارێتەوە ,ئەمیش جۆرە دەسەڵاتێكی تری خوا نیشان ئەدات ﴿١٧ واللیل إذا عسعس﴾ وە سوێند بەشەو كاتێ كە پشت هەڵدەكا و تاریك دەبێ تا تەواوی بوونەوەر دادەپۆشێ ﴿١٨ والصبح إذا تنفس﴾ سوێند بە سپێدەی بەرەبەیان كاتێ رووناكی خۆی دەردەخات وجیهان بەدەم هەموو شتێكەوە پێدەكەنێ ﴿١٩ إنه لقول رسول كریم﴾ سوێند بەوانە هەموو, بێگومان ئەم قورئانە قسەو وتەی نێراوێكی بەرێزە كە فریشتەی نیگاو سروشە. واتە فەرموودەی خوایە بەهۆی جبریلەوە نێردراوە ﴿٢٠ ذی قوة عند ذی العرش مكین﴾ خاوەنی هێزو مەكانەتە، لای عەرشی (خوا)ش زۆر بەرێزو پایە بەرزە، وەك دەفەرمووێ: (علمه شدید القوی* ذو مرة فاستوی)٦٥/٥٣. ﴿٢١ مطاع ثم امین﴾لەوێش (لەئاسماندا) فەرمانڕەواو قسەبیسراوە، ئەمین ودەست پاكە لەو سروشەدا دەیهێنێ, هیچ خیانەتی تێدا ناكا ﴿٢٢ وما صاحبكم بمجنون﴾ یارو هاوڕێكەتان موحەممەد ﷺ شێت ولێوە نیە, وەك ئێوە دژی پڕو پاڵاتە دەكەن. واتە: (جبریل) و (موحەمەد) هەردوو خاوەن رێزن لە دونیاو لەقیامەتدا. ﴿٢٣ ولقد رآه بالأفق المبین﴾ وبێگومان موحەممەد ﷺ فریشتەی سروش (واتە: جوبریل)ـی بینیوە لە سەر شێوەی خۆی لەئاسۆی ڕوون و نمایاندا، واتە: لەو جێگایە خۆر هەڵدێت, وەك دەفەرمووێ: (.. وهو بالافق الاعلی)٧/٥٣. بەڵێ پەیامبەر ﷺ لەماوەی تەمەنیدا دووجار جوبریلی دیتووە، ئەمە جارێكیانەو، ئەوی دیكەیش لەسوورەتی (نەجم)دا هاتووە: وەك دەفەرمووێ: (ولقد رآه نزلة أخری عند سدرة المنتهی * عندها جنة المأوی * إذ یغشی السدرة ما یغشی)٥٣/١٣-١٦. ﴿٢٤ وما هو علی الغیب بضنین﴾ و ئەو (پەیامبەرە) لەسەر گەیاندنی وەحی چكووس نیە ,واتە: كۆتایی و بەخیلی ناكا لەگەیاندنەكەیدا، وە زۆر بەرێك و پێكی دەیگەیەنێت ﴿٢٥ وما هو بقول شیطان رجیم﴾ ئەو قورئانەش قسەو گوفتاری شەیتانی نەفرەتكراو نیە , وەك ئێوە پێتان وایە! ﴿٢٦ فأین تذهبون﴾ جا ئیتر ئێوە بۆ كوێ دەچن..؟! ئەوە كەی رێگەیە گرتوتانەبەر، دەربارەی قورئان؟ جارێك پێی دەڵێن: جادووە، جارێك دەڵێن: هۆنراوەو شیعرە! ﴿٢٧ إن هو إلا ذكر للعالمین﴾ بەڕاستی ئەو تەنها ئامۆژگارییەكە بۆ جیهانەكانی ئادەمیی و پەری، وە لەوانە نیە ئێوە دەیڵێن ﴿٢٨ لمن شاء منكم أن یستقیم﴾ یاداوەرییە بۆ ئەوكەسەتان بیەوێ لە سەر رێی راست ئیستیقامەی ببێ، واتە: قورئان تەنها كەڵكی بۆ ئەوجۆرە كەسانە دەبێت ﴿٢٩ و ما تشاءون إلا أن یشاء الله رب العالمین﴾ وە ئێوە ئارەزووی ئیستیقامە ناكەن, مەگەر خوای خاوەنی جیهانەكان ئارەزووی بكات, جاكەوابوو داوای یارمەتی هەر لەو بكەن و، خۆشتانی بەتەواوی بۆ رێك بخەن، تا خوایش پشتیوانتان بێ و رێنماییتان بكا، ئەگینە خوا بەزۆر هیچ كەسێك ناهێنێتە ژێر بار.

كۆتایی تەفسیری سوورەتی (تەكویر)، زۆر سوپاس بۆ خوای باڵا دەست.

## ٨٢- سوورەی ( ئینفیتار )ـە

## مەككەییەو ( ١٩ ) ئایەتە

### بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

سوورەتی(ئینفیتار) وەك سوورەتی (تەكویر) باسی تەقینەوەو تێكچوونی سیستەمی بوونەوەرو، هاتنی رۆژی قیامەت دەكا، جا لە سەرەتاوە چەند دیمەنێكی بوونەوەر باسدەكات: وەك لەتبوون و بچڕانی ئاسمانەكان لەیەكترو، هەڵوەرین و كەوتنە خوارەوەی ئەستێرەكان و، تەقینەوەی زەریاو دەریاكان و، وەرگێڕانەوەی مردووی گۆڕەكان و پاداش وتۆڵەی مرۆڤەكان: (إذا السماء انفطرت.. علمت نفس ماقدمت وأخرت). پاشان نكوڵیی و ململانێی ئادەمیی، بەرامبەر بەو هەموو نازونیعمەت و بەهرەیە، خوای بەخشەر پێی بەخشیوە!!: (یا أیها الإنسان ما غرك بربك الكريم.. في أي صورة ماشاء ركبك) دواتر هۆی ئینكاریی و ململانێی مرۆڤەكان و، روون كردنەوەی ئەو ڕاستییە كە ئادەمیی هەرچەندە نكوڵی بكات، دەستەیەك لەفریشتەكان كاروكردەوەكانی دەنووسن: (كلا بل تكذبون بالدين.. يعلمون ماتفعلون). ئەو رۆژەش ئادەمیی دەبێتە دوو دەستەوە: دەستەی چاككاران و، دەستەی بەدكاران، دەرەنجامی هەردوولایشیان: (إن الأبرار لفي نعيم، وإن الفجار لفي جحيم.... يصلونها يوم الدين) دیمەنێكی زۆر سەخت و گرانی قیامەتیش نیشان دەدا: (وما أدراك مايوم الدين.. والأمر يومئذ لله) پێشەوا (ئەحمەد) لەبارەی فەزیلەتی ئەم سوورەتەوە ئەم فەرموودەیەی هێناوە: ((من سره أن ينظر إلى يوم القيامة كأنه رأي العين فيلقرا: (إذا الشمس كورت) و(إذا السماء انفطرت) و(إذا السماء انشقت)). واتە: ئەوەی پێیخۆشە كەبەچاوی خۆی بڕوانێتە دیمەنێكی رۆژی بەریێ، باسوورەتی (تەكویر) و (إنفطار) و (ئینشیقاق) بخوێنێ.



بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

إِذَا السَّمَاءُ انفَطَرَتْ ﴿١﴾ وَإِذَا الْكَوَاكِبُ انتَثَرَتْ ﴿٢﴾ وَإِذَا الْبِحَارُ
فُجِّرَتْ ﴿٣﴾ وَإِذَا الْقُبُورُ بُعْثِرَتْ ﴿٤﴾ عَلِمَتْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ
وَأَخَّرَتْ ﴿٥﴾ يَا أَيُّهَا الْإِنسَانُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ الْكَرِيمِ ﴿٦﴾ الَّذِي
خَلَقَكَ فَسَوَّاكَ فَعَدَلَكَ ﴿٧﴾ فِي أَيِّ صُورَةٍ مَّا شَاءَ رَكَّبَكَ ﴿٨﴾
كَلَّا بَلْ تُكَذِّبُونَ بِالدِّينِ ﴿٩﴾ وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَافِظِينَ ﴿١٠﴾ كِرَامًا
كَاتِبِينَ ﴿١١﴾ يَعْلَمُونَ مَا تَفْعَلُونَ ﴿١٢﴾ إِنَّ الْأَبْرَارَ لَفِي نَعِيمٍ ﴿١٣﴾ وَإِنَّ
الْفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٍ ﴿١٤﴾ يَصْلَوْنَهَا يَوْمَ الدِّينِ ﴿١٥﴾ وَمَا هُمْ عَنْهَا بِغَائِبِينَ
﴿١٦﴾ وَمَا أَدْرَاكَ مَا يَوْمُ الدِّينِ ﴿١٧﴾ ثُمَّ مَا أَدْرَاكَ مَا يَوْمُ الدِّينِ
﴿١٨﴾ يَوْمَ لَا تَمْلِكُ نَفْسٌ لِّنَفْسٍ شَيْئًا ۖ وَالْأَمْرُ يَوْمَئِذٍ لِّلَّهِ ﴿١٩﴾

سُورَةُ الْمُطَفِّفِينَ

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ ﴿١﴾ الَّذِينَ إِذَا اكْتَالُوا عَلَى النَّاسِ يَسْتَوْفُونَ ﴿٢﴾
وَإِذَا كَالُوهُمْ أَو وَّزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ ﴿٣﴾ أَلَا يَظُنُّ أُولَٰئِكَ أَنَّهُم
مَّبْعُوثُونَ ﴿٤﴾ لِيَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿٥﴾ يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿٦﴾



### مرۆڤ نابێ خوا لەبیر كاو، قیامەتیش هەر دێ:

﴿بسم الله الرحمن الرحيم * [١] إذا السماء انفطرت﴾ كاتێ ئاسمان (بەفەرمانی خوا) لەت لەت ئەبێ،و هێزی كێشندەی دەبچڕێ ﴿[٢] وإذا الكواكب انتثرت﴾ ودەمێك ئەستێرەكان بەربوونەوەو پەرش و بڵاوبوون و ڕژانە خوار و لەجێگای خۆیاندا ترازان ﴿[٣] وإذا البحار فجرت﴾ وساتێكیش دەریاكان تەقێنرانەوەو بەردرانە ناو یەكترو بوونە یەكپارچە ،بەهۆی جم و جوڵی زەوییەوە، وشیرین و سوێریان تێكەڵبوون ﴿[٤] وإذا القبور بعثرت﴾ كاتێكیش گۆڕەكان هەڵگێڕدرانەوەو،مردووەكان دەر هێنران لێیان وهەرچی لەناوسكی زەوییدا بوو فڕێیدایە دەرێ ﴿[٥] علمت نفس ما قدمت وأخرت﴾ كە ئەوانە روویاندا.. ئەوسا هەموو كەسێك ئەزانێ چی پێش خۆی خستووە لە چاك

وخراپ، دەشزانێ چیشی دوای خۆی خستووە لە سوننەتی(حسنه)و(سيئه) ﴿٦ يا أيها الإنسان ماغرك بربك الكريم﴾ ئەی ئادەمیی..!چیتۆی تەفرەو فریوداو بەرامبەر بەپەروەردگاری بەخشندەت کافر بوویت لەگەڵ ئەو هەموونیعمەت وبەخششانەدا؟ ﴿٧ الذى خلقك فسواك فعدلك﴾ ئەوەی دروستیکردیت لە نەبوون, ئینجا بەشێوەیەکی زۆر جوان ئەندامەکانی ڕێکخستیت, قەدو بەژن و باڵاو ئەندامی شیاو و گونجاوی پێ بەخشیت, جا ڕێك و پێکی کردیت، واتە: قەدو قامەت و باڵا لەجوانترین شێوەی پێبەخشیت ﴿٨ فى اى صورة ماشاء ركبك﴾ لەهەر شێوەو دیمەنێکدا خۆی ویستی یەکی خستیت ﴿٩ كلا بل تكذبون بالدين﴾ نەخێر، ئێوە تەفرە مەخۆن بەو ڕێزو حورمەتەی من بەرامبەرتان و لاڕێ مەبن، جادەبوو سوپاسگوزار بن، کەچی هێشتا بڕواشتان بەڕۆژی پاداشت و تۆڵە نیەو ئینکاری دەکەن.

### فریشتە گشت کارێکی مرۆڤ تۆمار دەکەن:

﴿١٠ وإن عليكم لحافظين﴾ لەکاتێکدا -کە ئێوە ئەوەندەش لاسارو یاخین- دەستەیەك لە فریشتەی چاودێر و پارێزەرتان لەسەر دانراوە ,هەرچی بکەن ئەینووسن ﴿١١ كراما كاتبين﴾ ڕێزدارانێکی نووسەرن ﴿١٢ يعلمون ماتفعلون﴾ ئەزانن چی دەکەن , واتە:بەهەموو کارو کردەوەیەکتان بە ئاگان.

### پاداشی چاکان و، تۆڵەی خراپان:

﴿١٣ إن الأبرار لفي نعيم﴾ بەڕاستیی چاکان لە ناو خۆشی بەهەشتدان ﴿١٤ وإن الفجار لفي جحيم﴾ و بێگومان تاوانباران و بەدکارانیش لە ئاگری دۆزەخدان ﴿١٥ يصلونها يوم الدين﴾ لەڕۆژی پاداشتدا دەچنە ناویی و,گەرمای ئەچێژن و دەسوتێن ﴿١٦ وماهم عنها بغائبين﴾ وقەتیس دەمێنن و، هەرگیز لێنابڕێن و دوور نابن ,بەڵکو بەهەتا هەتایی لەوێن ﴿١٧ وما أدراك ما يوم الدين﴾ وە تۆ بەچی ئەزانیت (ئەی ئینسان!) ڕۆژی پاداشت چیە و چۆنە؟ ئەوەندە گران و سەختە، مەگەر خوا خۆی وێنەیت بۆ باس بکات ﴿١٨ ثم ما أدراك ما يوم الدين﴾ دیسان -بۆجارێکی تر- تۆ چووزانیت ڕۆژی قیامەت و پاداشت و تۆڵە چیە و چۆنە؟ ﴿١٩ يوم لا تملك نفس لنفس شيئا﴾ ڕۆژێکی سەختی وەهایە کەهیچ کەسێك بۆ کەسێکی تر هیچی بە دەست نیە ﴿والأمر يومئذ لله﴾ وەئەو ڕۆژە هەموو کارو فرمانێك هەر بۆ خوایە,وەکو لە جێگایەکی تردا دەفەرموێ: (لمن الملك اليوم، لله الواحد القهار)٠٤/١٦. "هیچ کەسێکیش ناتوانێت چەلەحانێ و ململانێی لەگەڵ خوا بکا.

کۆتایی تەفسیری سوورەتی (ئینفیطار)

لەگەڵ سوپاسی زۆرم بۆ خوای گەورە.

*** *** ***

## ٨٣- سوورەتی ( موطه‌ففين )ـه

## مەککەییەو ( ٣٦ ) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتە باسی تەرازو بازیی خەڵکانی مەککە دەکات، هەرچەندە دەبوو ئەم حوکم و مەسەلە شەرعییە لە مەدینەدا باس بکرایە، جا لەبەرئەوە بۆتە جێی سەرنج و ورد بوونەوەی ڕاڤەکەرانی قورئان، (ئیبن ماجە) ٧٤٨/٢ لە (ئیبن عەبباس)،وە دەڵێ: ((لما قدم نبى الله ﷺ المدينة كانوا من أخبث الناس كيلاً، فأنزل الله سبحانه وتعالى:"ويل للمطففين"، فحسنوا الكيل بعد ذلك)). واتە: ئەو دەمەی کە پەیامبەر ﷺ هاتە مەدینە خەڵکانی ئەوێ بەشێوەیەکی

زۆر خراپ کێشانەو پێوانەیان دەکرد، تا دەرئەنجام فەرمایشتی (ویل للمطففین)هات، پاشان حاڵی خۆیانیان گۆڕیی و چاك بوون. سەرەڕای ئەوەیش وەك سوورەتە مەککەییەکانی تر باسی بیروباوەڕە بنەڕەتیە ئیسلامییەکان دەکات" لەسەرەتاوە هێرشێکی توندو تیژ دەکاتە سەر خەڵکانی تەرازووبازچی، ئەوانەی وا لە قیامەت ناترسن و، هیچ حسابێك بۆ خۆیان ناکەن: (ویل للمطففین الذین إذا اکتالوا علی الناس یستوفون) پاشانیش باسێك لە هەموو سنوور دەرچوو و، بەدکاران دەکات لەگەڵ هەڵسەنگاندنی پاداش و تۆڵەیاندا: (کلا إن کتاب الفجار لفی سجین، وما أدراك ما سجین...) ئینجا لاپەڕەیەکی جوانی زێڕین بۆ چاکان و پارێزگاران دێنێت: (إن الأبرار لفی نعیم..) وە بەکورتە باسێك لە هەڵوێستی بەدکاران بەرامبەر بە موسڵمانان کۆتایی دێ: (إن الذین اجرموا کانوا من الذین آمنوا یضحکون).

الجزء الثلاثون — سورة المطففين

كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلْفُجَّارِ لَفِى سِجِّينٍ (٧) وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا سِجِّينٌ (٨) كِتَٰبٌ
مَّرْقُومٌ (٩) وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ (١٠) ٱلَّذِينَ يُكَذِّبُونَ بِيَوْمِ ٱلدِّينِ (١١)
وَمَا يُكَذِّبُ بِهِۦٓ إِلَّا كُلُّ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ (١٢) إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَٰتُنَا قَالَ أَسَٰطِيرُ
ٱلْأَوَّلِينَ (١٣) كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ (١٤) كَلَّآ إِنَّهُمْ
عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ (١٥) ثُمَّ إِنَّهُمْ لَصَالُوا۟ ٱلْجَحِيمِ (١٦) ثُمَّ يُقَالُ
هَٰذَا ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ (١٧) كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلْأَبْرَارِ لَفِى عِلِّيِّينَ
(١٨) وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا عِلِّيُّونَ (١٩) كِتَٰبٌ مَّرْقُومٌ (٢٠) يَشْهَدُهُ ٱلْمُقَرَّبُونَ
(٢١) إِنَّ ٱلْأَبْرَارَ لَفِى نَعِيمٍ (٢٢) عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ (٢٣) تَعْرِفُ فِى
وُجُوهِهِمْ نَضْرَةَ ٱلنَّعِيمِ (٢٤) يُسْقَوْنَ مِن رَّحِيقٍ مَّخْتُومٍ (٢٥)
خِتَٰمُهُۥ مِسْكٌ وَفِى ذَٰلِكَ فَلْيَتَنَافَسِ ٱلْمُتَنَٰفِسُونَ (٢٦) وَمِزَاجُهُۥ
مِن تَسْنِيمٍ (٢٧) عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا ٱلْمُقَرَّبُونَ (٢٨) إِنَّ ٱلَّذِينَ
أَجْرَمُوا۟ كَانُوا۟ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يَضْحَكُونَ (٢٩) وَإِذَا مَرُّوا۟ بِهِمْ
يَتَغَامَزُونَ (٣٠) وَإِذَا ٱنقَلَبُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَهْلِهِمُ ٱنقَلَبُوا۟ فَكِهِينَ (٣١)
وَإِذَا رَأَوْهُمْ قَالُوٓا۟ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَضَآلُّونَ (٣٢) وَمَآ أُرْسِلُوا۟ عَلَيْهِمْ
حَٰفِظِينَ (٣٣) فَٱلْيَوْمَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنَ ٱلْكُفَّارِ يَضْحَكُونَ (٣٤)

على الأرائك ينظرون — ٥٨٨

### کەم فرۆشی مایەی زیانمەندی دوا رۆژە:

﴿بسم الله الرحمن الرحیم *[١] ویل للمطففین﴾ تیاچوون بۆیاریکەران بە پێوانەوتەرازوو ﴿[٢] الذین إذا اکتالوا علی الناس یستوفون﴾ ئەوانەی کاتێ‌پێوانە بۆ خۆیان بکەن و شت لە خەڵکی بکڕن، بەڕێك و پێکی ئەنجامی دەدەن و بە تەواوی وەری ئەگرن ﴿[٣] وإذا کالوهم او وزنوهم یخسرون﴾ وەکاتێ پێوانە، یا کێشانە بۆ خەڵك بکەن و شتیان پێ بفرۆشن بە ناتەواوی بۆیان ئەنجام ئەدەن، جا ئایەتی: (واوفوا الکیل إذا کلتم)٣٥/١٧. یان: (واقیموا الوزن بالقسط ولا تخسروا المیزان)٩/٥٥. بۆ دوپاتی راستکردنەوەی ئەو حاڵەتــە ناهەموارەیــە ﴿[٤] الا یظــن اولئــك انهــم مبعثون﴾ئایائەوانە نازانن و بڕوایان نیە کە بەڕاستی زیندوو ئەکرێنەوە بۆ وەرگرتنی تۆڵەی فێڵ و خەیانەتیان ﴿[٥] لیوم عظیم﴾ بۆرۆژێکی زۆر بەسام و گەورە. واتە: ترازوو بازی کردەی کەسێکە هەرگیز بڕوای بە زیندوو بوونەوە نەبێت..! ﴿[٦] یوم یقوم الناس لرب العالمین﴾ ئەو رۆژەی هەموو خەڵکی بە پێوە دەوەستن بۆ حوکم و فەرمانی خواوەندی جیهانەکان.

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ئەڵێ: پەیامبەر ﷺ ئەفەرموێ: ((یوم یقوم الناس لرب العالمین) حتی یغیب أحدهم فی رشحه إلی انصاف اذنیه)) فتح: ٥٦٥/٨. واتە: ئەو رۆژە ئەوەندە سەختە و خەجاڵەت هێنەرە، هەریەکەیان لەنێو ئارەقی خۆیدا تا بنە گوێی ون ئەبێ. متفق علیه.

### کارنامەی بەدکاران لە (سجّین)دایە:

﴿[٧] کلا﴾ دەست لە یاریکردن بە پێوانەو تەرازوو هەڵگرن ﴿إن کتاب الفجار لفی سجین﴾ بەڕاستی کارنامەی بەدکاران لەجێگایەکی زۆر تەنگ و قوڵی دۆزەخدایە پێیدەڵێن: (سجین). بۆیە ئەفەرموێ: (ثم رددناه اسفل سافلین...)٥/٩٥. یان (وإذا القوا فیها مکانا ضیقا مقرنین دعوا هنالك ثبورا)١٣/٢٥. ﴿[٨] وما ادراك ما سجین﴾ چی

تـۆی شـارەزا کـرد (سجین) چیـە؟ ﴿٩ کتـاب مرقـوم﴾ نامەیـەکی مـۆر کـراوو لۆکـە، وەهـیچ خێرێکـی تیا نیـە، وە دەستکاریش ناکرێ، چۆن کردەوەکانیان تۆمار کرابێ، وادیتە بەردەستیان ﴿١٠ ویل یومئذ للمکذبین﴾ تیاچوون لەو رۆژەدا بۆ بەدرۆ خەرەوان ﴿١١ الذین یکذبون بیوم الدین﴾ ئەوانەی بڕوایان بە رۆژی پاداش و تۆڵە نیە و بەدرۆی دەزانن ﴿١٢ وما یکذب به إلا کل معتد اثیم﴾ خۆ مەگەر هەر مرۆڤە سنوور بەزێن و گوناهبارەکان بەدرۆی بزانن و باوەڕی پـێ نەکـەن ﴿١٣ إذا تتلـی علیـه آیاتنـا﴾ کـاتێ ئایەتـەکانی ئێمـەی بەسـەرا بخوێنـدرێ بـۆ چەسپاندن و دووپاتکردنـەوەی زینـدوو بوونـەوە ﴿قـال اساطیر الأولین﴾ دەڵێ ئەمە ئەفسانەی پێشینانە تۆمار کـراوە، وەك لـە جێگایەکی تردا ئەفەرموێ: (وإذا قیل له ماذا انزل ربکم قالوا أساطیر الأولین)١٦/٢٤. یان دەفەرموێ: (قالوا اساطیر الأولین اکتتبها فهی تملی علیه بکرة واصیلا)٢٥/٥. ﴿١٤ کلا﴾ نا،ئەفسانەی پێشووان نیە ﴿بل ران علی قلوبهم ماکانوا یکسبون﴾ بەڵکو ئەوەی دەیانکرد لـە تاوان و گوناە زاڵبووە بە سەر دڵەکانیاندا، بۆیـە ڕاست و ناڕاست لەیەك ناکەنەوەو ئایەتەکانمان بەدرۆ دەخەنەوە.

ئیمامی (ترمزیی) و (نەسائیی) ئەم فەرموودەیە دێنن: (هەربەندەیـەك کە گونـاح دەکات، خێرا خاڵێکی ڕەش بەدڵیەوە دەنووسێ، جائەگەر تەوبەی کرد و پەشیمان بوویـەوە، ئـەوا لێـی پاك ئەبێتەوە، ئەگەرنا، وردە وردە زیاد ئەکا تا بەتەواوی دڵی ژەنگ دەگرێت، هەر ئەوەیە کەخوا ئەفەرموێ: (کلا بل ران علی قلوبهم ماکانوا یکسبون). ﴿١٥ کلا إنهم عن ربهم یومئذ لمحجوبون﴾ ئاگـاداربن! بەڕاستی ئەوانـە لـەو رۆژەدا لـەدیتنی خواوەندیان مـەحجووبن ونابیینن.

پێشەوا (شافیعی) دەڵێت: ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر دیتن و بینینی خوای پەروەردگار لەرۆژی بەرێدا" پێشەوا (مالیك)یـش دەڵێـت: کاتێـك کـە دیتنـی زاتـی خـوا دوژمنـانی لێ بـێ بـەش بکرێـت، ئـەوا بێگومانـە کـەزاتی خـۆی دەرئەخات بۆ دۆستەکانی، وەك ئەفەرموێ: (وجوه یومئذ ناضرة * إلی ربها ناظرة)٧٥/٢٢-٢٣. ﴿١٦ ثم إنهم لصالوا الجحیم﴾ پاشان بێگومان دەخرێنە ناو دۆزەخەوەو دەسوتێن ﴿١٧ ثم یقال هذا الذی کنتم به تکذبون﴾ پاش چوونە ناو دۆزەخ پێیان ئەوترێ: ئەمە ئەو سزایەیە ئێوە بەدرۆتان دەزانی.

## کارنامەی پیاوچاکانیش لە (علیین)دایە:

﴿١٨ کـلا إن کتـاب الأبـرار لفـي علـیین﴾ ئاگـاداربن! کەکارنامـەی چـاکان لەجێگایـەکی زۆر بـەرزو بڵندادایـە لەبەهەشتدا ﴿١٩ وما ادراك ما علیون﴾ جا تۆ چووزانیت ئەو جێگا بەرزە چیە؟ ﴿٢٠ کتاب مرقوم﴾ نامەیەکی سەر بە مۆروو لۆکە و، خێری تێدایە ﴿٢١ یشهده المقربون﴾ فریشتە نزیکەکانی خوا دەیکەنەوەو ئەیبینن و ئامادەی ئەبن، واتە: نامەی کردەوەکان لای فریشتەکان هەڵگیراوە. (ئیبن عـەباس) لە (کەعب)ی پرسی: (سجین) لەکوێیە؟ وتی: زەویـی حەوتـەمـەو رۆحـی کـافرو خـوا نەناسـان فرێدەدرێتـە ئـەوێ، (علـیین)یـش لـەئاسمانی حەوتەمـەو، رۆحـی ئیمانداراني بۆ دەبرێت، طەبەری: ٢٩١/٢٤. ﴿٢٢ إن الأبرار لفي نعیم﴾ بەڕاستیی چاکان لەناو خۆشیو بەهرەیەکی ئێجگار زۆردان لەبەهەشتدا ﴿٢٣ علی الآرائك ینظرون﴾ لەسەر کورسی و قەنەفە رازاوەکانی بەهەشتدا دانیشتوون و تەماشای ئەو هەموو نازو نیعمەت و بەهرەی بەهەشتە ئەکەن کە بۆیان ئامادە کراوە ﴿٢٤ تعرف فی وجوههم نضرة النعیم﴾ لـە رووخسـاریاندا رووگەشـی وخۆشـی بەهەشـت دەبینـی و دەزانیـت ﴿٢٥ یسقون من رحیق مختوم﴾. لەشەرابێکی پاك و صاف و سەرمۆریان پێدەنۆشێ ، واتە: دەستی هیچ کەسێکی لێ نەکەوتووە، وچاکان خۆیان سەرەکەی لادەبەن ﴿٢٦ ختامه مسك﴾ دوا قومی بۆنی میسکی لێ دێت، واتە: وەك شـەرابی دونیا نیـە تا بۆ گەنی و

سەرئێشەو دەردوداوێکی زۆری هەبێت ﴿وفي ذلك فليتنافس المتنافسون﴾ جا ئەوانەی کە پێشبڕکێ و پێشدەستی دەکەن بالەوەدا پێش دەستی و کێبەرکێ بکەن و هەوڵبدەن بۆکارو کردەوەی چاك, وەك ئەفەرموێ: (لمثل هذا فليعمل العاملون). ﴿٢٧ ومزاجه من تسنيم﴾ هەروەها ئەو شەرابە پاکە لەگەڵ ئاوی کانیاوێکی بەرزو پاك و خۆشدا تێکەڵکراوە, واتە: شەرابی بەهەشت لەئاوی (تەسنیم)ی تێکەڵ ئەکرێ، ئەوجا ئەیاندرێتێ بیخۆنەوە ﴿٢٨ عينا يشرب بها المقربون﴾ سەرچاوەیەکە نزیکانی خوا لێی ئەخۆنە وە، کەوابوو پلەی (مقربون) بەرزترە لەپلەی (أ برار).

**تاوانباران بە موسڵمانان پێدەکەنن:**

ناودارانی قورەیش هەردەم پێدەکەنین و سووکایەتیان بە موسڵمانانی ئەو سەردەمە ئەکرد، جا خوایبە بەزەیی ئەم ئایەتەی ناردو فەرمووی: ﴿٢٩ إن الذين أجرموا كانوا من الذين آمنوا يضحكون﴾ بێگومان ئەوانەی بەدکردار بوون لە دونیادا پێدەکەنین بەوانەی بڕوایان هێنابوو ﴿٣٠ وإذا مروا بهم يتغامزون﴾ وکاتێ بەلایاندا تێدەپەڕین سرتە سرتیان دەکردو چاویان لە یەکتر دادەگرت, بەمەبەستی ئازاردانی دڵ و دەروونی بڕوادارەکان ﴿٣١ وإذا انقلبوا إلى أهلهم﴾ وکاتێکیش دەگەڕانەوە بۆلای خێزانی ماڵەوەیان ﴿انقلبوا فكهين﴾ بە خۆشیی بردن بەگاڵتە کردنەکەیان بە ئیماندارەکان دەگەڕێنەوە ﴿٣٢ وإذا رأوهم﴾ وکاتێ بڕوادارەکانیان دەبینی ﴿قالوا إن هؤلاء لضالون﴾ ئەیانوت: بە راستیی ئەو کۆمەڵە بڕوادارانە سەرلێشێواو و گومڕان! ﴿٣٣ وما ارسلوا عليهم حافظين﴾ لەکاتێکدائەوان نەنێردرابوون بە چاودێر بەسەریانەوە, واتە: بۆخۆیان دەڵێن، ئەینە ئەوان مافی ئەوەیان نیە کارو کرداری موسڵمانان هەڵسەنگێنن.وە لە جێگایەکی تردا دەفەرموێ: (إنه كان فريق من عبادي يقولون ربنا فاغفر لنا وارحمنا وأنت خير الراحمين فاتخذتموهم سخريا حتى أنسوكم ذكري وكنتم منهم تضكون) ١١٠/٢٣. بۆدووپاتی ئەو ماناو مەبەستەیە ﴿٣٤ فاليوم الذين آمنوا﴾ ئیتر ئەمڕۆش -ڕۆژی قیامەت- بڕوادارەکان ﴿من الكفار يضحكون﴾ بەکافران و بێ بڕواکان پێدەکەنن, واتە: هەروەك ئەوان لەدنیادا گاڵتەیان بەمان ئەکرد، ئەمانیش لەوڕۆژەدا گاڵتە بەوان ئەکەنەوە ﴿٣٥ على الأرائك ينظرون﴾ لەسەر قەنەفە ڕازاوەکانەوە پاڵیان لێداوەتەوەو تەماشا ئەکەن و دۆزەخییەکان بەچاوی خۆیان دەبینن و پێیان دەڵێن: ﴿٣٦ هل ثوب الكفار ماكانوا يفعلون﴾ ئاخۆ بێ بڕواکان پاداشتی کاروکردەوەکانیان دەراوەتەوە؟.

بەڵێ لەهەموسەردەمێکدا ئەوجۆرە مرۆڤە تاوانبارو خراپکارانە هەن و سوکایەتی و گاڵتە و لاقرتێ بەدەستەی بڕواداران ئەکەن و، دانا و زانا دەبێ بەنادان و نەزان و، نەزانیش دەبێ بەزانا.!! جا لەپاشەڕۆژدا هەموویان بەری کێڵگەی خۆیان دەخۆنەوە.

کۆتایی تەفسیری سوورەتی (مطففين).

زۆر سوپاس بۆ خوای کارجوان.

***　***　***

## ٨٤- سوورەتی (ئینشیقاق)ـە

## مەککەییەو (٢٥) ئایەتە

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

ئەم سوورەتە وەك سورەتی (تەکویر) و (إنفطار) باسی وێرانبوونی جیهان و ئاسمانەکان و زەویی دەکات، پێش هاتنی ڕۆژی دوایی، وە هەر وەکو هەموو سورەتە مەککەییەکانی تر، باسی بیروباوەڕە سەرەکییەکانی ئیسلام

دەكات، جا لەسەرەتاوە هەندێ دیمەنی وەرگەڕان و وێران بووی بوونەوەر باس ئەكات: (إذا السماء انشقت، وأذنت لربها وحقت) لەپاشانیش باسی ئادەمیزاد دەكات كە چۆن هەمیشە ماندوو شەكەت ئەبێ لەپێناوی بەدەست هێنانی ڕزق و ڕۆزیدا دەرەنجام یان چاكە پێش ئەخات بۆ پاشەڕۆژی خۆی، یان خراپە، دیارە پاداش و تۆڵەیش هەر بەپێی ئەو هەوڵانە دەبێت: (یا أیها الإنسان إنك كادح إلى ربك كدحا فملاقیه) كەمێكیش هەڵوێستی بێ بڕوایان سەبارەت بەقورئان باس دەكاو، تێشیان ئەگەیەنێت كە سزاو ئەشكەنجەیەكی گەورەیان لەقیامەتا تووش دەبێت، لەكۆتاییشدا باسی بێ بڕوایان دەكاو سەرزەنشتیان دەكات لەسەر ئەوەی كە بڕوا ناهێنن لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگانەدا. جا لەگەورەیی و فەزیلەتی ئەم سوورەتەیە كە پێشەوا (بوخاریی) ئەم فەرموودەی هێناوە: (ئەبو رافیع) دەڵێ: لەدوای (ئەبوو هورەیرە)وە نوێژی (عیشا)م كرد، دەبینم سوورەتی(إذا السماء انشقت)ی خوێندەوەو، سوژدەشی برد، منیش وتم: ئەوە چی بوو ئەوسوژدەیە؟ وتی: منیش جارێ لەدوی (ئەبولقاسم)ەوە موحەممەد ﷺ نوێژم كرد، دیتم سوژدەی برد، بۆیە تامنیش ماوم لەم جێگایەدا هەر سوژدە دەبەم. فتح الباري: ۲۹۲/۱.

الجزء الثلاثون — سورة الانشقاق

عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ ﴿٣٥﴾ هَلْ ثُوِّبَ ٱلْكُفَّارُ مَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴿٣٦﴾

سُورَةُ الانشِقَاق — ترتيبها ٨٤ — آياتها ٢٥

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتْ ﴿١﴾ وَأَذِنَتْ لِرَبِّهَا وَحُقَّتْ ﴿٢﴾ وَإِذَا ٱلْأَرْضُ مُدَّتْ
﴿٣﴾ وَأَلْقَتْ مَا فِيهَا وَتَخَلَّتْ ﴿٤﴾ وَأَذِنَتْ لِرَبِّهَا وَحُقَّتْ ﴿٥﴾ يَٰٓأَيُّهَا
ٱلْإِنسَٰنُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدْحًا فَمُلَٰقِيهِ ﴿٦﴾ فَأَمَّا مَنْ أُوتِىَ
كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ ﴿٧﴾ فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا ﴿٨﴾ وَيَنقَلِبُ
إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ مَسْرُورًا ﴿٩﴾ وَأَمَّا مَنْ أُوتِىَ كِتَٰبَهُۥ وَرَآءَ ظَهْرِهِۦ ﴿١٠﴾ فَسَوْفَ
يَدْعُوا۟ ثُبُورًا ﴿١١﴾ وَيَصْلَىٰ سَعِيرًا ﴿١٢﴾ إِنَّهُۥ كَانَ فِىٓ أَهْلِهِۦ مَسْرُورًا ﴿١٣﴾
إِنَّهُۥ ظَنَّ أَن لَّن يَحُورَ ﴿١٤﴾ بَلَىٰٓ إِنَّ رَبَّهُۥ كَانَ بِهِۦ بَصِيرًا ﴿١٥﴾ فَلَآ أُقْسِمُ
بِٱلشَّفَقِ ﴿١٦﴾ وَٱلَّيْلِ وَمَا وَسَقَ ﴿١٧﴾ وَٱلْقَمَرِ إِذَا ٱتَّسَقَ ﴿١٨﴾
لَتَرْكَبُنَّ طَبَقًا عَن طَبَقٍ ﴿١٩﴾ فَمَا لَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٢٠﴾ وَإِذَا قُرِئَ
عَلَيْهِمُ ٱلْقُرْءَانُ لَا يَسْجُدُونَ ۩ ﴿٢١﴾ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يُكَذِّبُونَ
﴿٢٢﴾ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُوعُونَ ﴿٢٣﴾ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢٤﴾
إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ ﴿٢٥﴾

٥٨٩

**كە قیامەت هات ئاسمان ترەك دەباو، زەوی رادەخرێ:**

﴿بسم الله الرحمن الرحیم* [١] إذا السماء انشقت﴾ كاتێك ئاسمان لەت و پەت بوو وئەم دەستووروو سیستەمە نەما و هەڵوەشایەوە ﴿[٢] وأذنت لربها وحقت﴾ وە گوێڕایەڵی فەرمانی پەروەردگاری خۆی بوو شیاویش بوو بۆی ملكەچ بێت ﴿[٣] وإذا الأرض مدت﴾ كاتێكیش زەویی پان و فراوان كرا وكێوەكان بەرزو نزمیان تیا نەما و، بوونە دەشتێكی كاكی بەكاكی، وەك (ئیبن جەریر) ئەم فەرموودە دێنێ: ((إذا كان یوم القیامة مد الله الأرض مد الأدیم حتى لا یكون لبشر من الناس إلا موضع قدمیه)).واتە: كە رۆژی قیامەت هات، خواوەند – وەك پێستە- ﴿زەوی رادەخاومەردمیش تەنیا جێی پێی خۆی دەبێتەوە ، ئەوسا (پێغەمبەر) یەكەم كەسێكم شەفاعەتی ئوممەتم دەكەم. ﴿[٤] والقت مافیها وتخلت﴾ وە چی تیا بوو تووڕی دا وخاڵی بووە ولێی. ﴿[٥] وأذنت لربها وحقت﴾ و گوێڕایەڵی فەرمانی پەروەردگاری خۆی بوو، وە شیاویش بوو بۆی ملكەچ بێ جا كە ئەوە ڕووی دا مرۆڤ ئەبینێ چی پێشی خۆی خستووە لە چاكە وخراپە.

**پاداش و تۆڵە بۆ كاروكردەوەی راستە:**

﴿[٦] یا أیها الإنسان﴾ ئەی ئادەمیی! ﴿إنك كادح إلى ربك كدحا فملاقیه﴾ بەڕاستیی تۆ هەردەم لە كۆششكردندایت بە كۆشش كردنێكی جددی بۆ لای پەروەردگارت، جا پێی دەگەیت تێكۆشاندایت و زۆر خۆت ماندوو دەكەیت، سەرەنجامیش دەبێ بەرەو پەروەردگارت بڕۆیت و رووبەڕووی ئەو ببیتەوەو بچییە دیداری، جا

ئیتر ئەوکاتە بەری کێڵگەی خۆت ئەخۆیتەوە لە چاکە، یان لە خراپە، وەك ئەفەرموێ: ﴿٧ فأما من اوتی كتابه بيمينه﴾ ئینجا ئەوکەسەی نامەو دۆسیەی کارو کردەوەکانی درایە دەستی ڕاستی , کە ئەوەش نیشانەی بەختیارییە ﴿٨ فسوف يحاسب حسابا يسيرا﴾ ئیتر پرسینەوەیەکی سووك و ئاسانی لەگەڵدا دەکرێت، پاشان پاداش وەرئەگرێ، وە لەخراپەکانیشی ئەبووردرێ ﴿٩ وينقلب إلى اهله مسرورا﴾ و بەخۆشیی و، شادییەوە ئەگەڕێتەوە لای ژن ومناڵ وخزم و کەس و کاری خواناسی لە بەهەشتدا. ﴿١٠ واما من اوتی كتابه وراء ظهره﴾ وە بەڵام ئەو کەسەی کە لەپشتییەوە نامەی کردەوەکانی درایە دەستی، کە ئەوە نیشانەی بەدبەختییە ﴿١١ فسوف يدعوا ثبورا﴾ ئەوا هاوارو دادی لێ هەڵدەستێ وداوای مردنی خۆی ئەکات ﴿١٢ ويصلى سعيرا﴾ چونکە ئەزانێ رادەکێشرێتە ناو ئاگرێ کی بڵێسەدارو سوتێنەرەوە، سزاو گەرمایشی ئەچێژێ، لەبەر ئەوە کە:

یەکەم: ﴿١٣ إنه كان فى اهله مسرورا﴾ چونکە ئەو لەدونیادا لەناو خزم وکەس و کاری خۆیدا کەیف خۆش و شاد بوو.

دووەم: ﴿١٤ إنه ظن ان لن يحور﴾ پێی وابوو کە هەرگیز زیندوو نابێتەوەو ناگەڕێتەوە بۆلای پەروەردگاریی ﴿١٥ بلى إن ربه كان به بصيرا﴾ بەڵێ دەگەڕێتەوەو مەحاسەبەی دەکرێ، وە بەڕاستیی پەروەردگاریی لە دنیادا چاك ئاگاداری کردەوەکانی بوو وبینا پێیان.

**مرۆڤ قۆناغی جیاجیا دەبڕێ:**

﴿١٦ فلا اقسم بالشفق﴾ جا سوێند ئەخۆم بەسوورایی دەمیی ئێواران کە تا وەختی عیشا دەخایێنێ. ﴿١٧ والليل وما وسق﴾ وە بەشەوو بەو شتانەش کۆیان ئەکاتەوە لە تاریکیەکەیدا لە خەڵکی وئاژەڵ وهتد. ﴿١٨ والقمر إذا اتسق﴾ وە سوێندم بەمانگی چواردە، ئەوکاتە کە پڕ ئەبێتەوە و خەرمانە ئەدا ﴿١٩ لتركبن طبقا عن طبق﴾ سوێند بەوانە ئێوە پلە بەپلە دەگەن بە سەختیەکانی قیامەت.

**لەبەر لووت بەرزیی و فیز باوەڕ ناهێنن:**

﴿٢٠ فما لهم لا يؤمنون﴾ جا چییانە باوەڕ ناهێنن؟، دوای ئەو هەموو بەڵگەو نیشانانە، دەبوو مرۆڤی بیر تیژو ژیر ملی راکێشایە بۆخوا، نابینێ شەو چۆن چەتری رەشی خۆی هەڵدەدات و، مانگ و ڕووناکییەکەی ئەخاتە ئاسمان؟! ﴿٢١ وإذا قرئ عليهم القرآن لا يسجدون﴾ وە کاتێ قورئانیان بەسەردا بخوێنرێ سەر دانانەوێنن بەوەی باوەڕی پێ بێنن ﴿٢٢ بل الذين كفروا يكذبون﴾ لە بەر ئەوە نییە قورئان کاریگەریی نەبێت لە سەریان بەڵکو ئەوانەی کافرن درۆی دەدەنە پاڵ، بۆیە کاتێ قورئان بەسەریاندا دەخوێنرێ ملکەچی نابن ﴿٢٣ والله اعلم بما يوعون﴾ وە خواش زاناترە بەوەی دەیشارنەوە لەسنگیاندا دەر بارەی قورئان وپێغەمبەرو ئیسلام ﴿٢٤ فبشرهم بعذاب اليم﴾ دەسا تۆش مژدەیان پێ بدە بە سزایەکی بەئێش ﴿٢٥ إلا الذين آمنوا﴾ بەڵام ئەوانەی بڕوایان هێناوە ﴿وعملوا الصالحات﴾ کارە چاکەکانیان کردووە ﴿لهم اجر غير ممنون﴾ پاداشێکی نەبڕاوەیان بۆ هەیە وهەردەم لەژێر میهرەبانی خوای گەورەدان، وەك لەئایەتی تردا ئەفەرموێ: (عطاء غير مجذوذ)١١/١٠٨.

کۆتایی تەفسیری سوورەتی(ئینشیقاق).

ولله الحمد والمنة وبه التوفيق والعصمة.

*** *** ***

## ٨٥- سوورەتی (بروج )ـه

## مەككەییيەو (٢٢) ئايەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتە چەند حەقیقەت و ڕاستییەك لە بیروباوەڕی ئیسلام نیشان دەدات، تەوەرەكەیشی باسی خاوەن لەغەمەكان (أصحاب الاخدود)ن، ئەوانەی وا بە ئەوپەڕی دڵڕەقییەوە ئەشكەنجەو ئازاری ئیمانداره‌كانیاندا, ئەوانیش بە ئەو پەڕی متمانەوە بیروباوەڕی خۆیانیان پاراست و ململانێیان لەگەڵ ئەو تاغووتانەداكرد، وەبەچەندین سوێند دەست پێدەكات لەسەر ئەوەی كە تاوانباران لەناو ئەبرێن و سزا ئەدرێن، پاشان هەڕەشە ئەكا لەوانەی كە ئەزیەت و ئازاری موسڵمانان ئەدەن، ئینجا تواناو دەسەڵاتی خوا بۆ تۆڵە سەندن لەتاوانباران باس ئەكا، لەدواییدا بە كورتەیەك داستانی فیرعەون ودەسەڵاتی خوای گەورە بەرامبەریان دێتە پێش. جابەم شێوەیە دەست پێدەكات: ﴿بسم الله الرحمن الرحيم* [١] والسماء ذات البروج﴾ سوێند بەئاسمانی دوازدە كەلو (بورج)ـە، كەخۆر لەساڵێكدا بەهەر دوازدەكەدا تێدەپەڕێ، واتە: هەرمانگەی لەیەكێكیانەوە دەڕوات، كە ئەمەیش دەسەڵاتی بێ سنووری خوا نیشان ئەدات ﴿[٢] واليوم الموعود﴾ وە بە ڕۆژی بەڵێن دراو، بۆ حیساب و پاداش ﴿[٣] وشاهد ومشهود﴾ وە بەهەموو ئەوشتانە دەبینن وبەوشتانەیش دەبینرێن، ئەگەرچی زۆربەی ڕاڤەكەرانی قورئان دەڵێن: مەبەست بە (شاهد) ڕۆژی هەینییە، و مەبەست بە (مشهود) ڕۆژی (عەرەفە)یە. البغوی/٤/٤٦٦، هەروەكو (ئیبن جەریر) فەرموودەیەكی هێناوە بۆ ئەو ڕاستیە، جاسوێند بە هەمووئەمانە, لەپێش ئێوەوە كۆمەڵێ موسڵمان هەبوون لەسەر ئاینی عیسا ﷺ تووشی دەسەڵاتدارێكی دڵڕەقی بێ بەزەیی, ئەمیشە دەردی سەریی ئەدان، بۆئەوەی لەئاینەكەیان وەریان گێڕێ و پەشیمان ببنەوە، بەڵام هەموو هەوڵەكانیان بە نەزۆك مایەوە، بۆیە بڕیاریاندا بیانسوتێنن، جا ئەوەبوو هاتن لەغمێكی گەورەیان بۆ هەڵكەندن و ئاگریان تیا كردەوەو، بڕوادارەكانیان خستە ناویەوەو، هیچ كەسێكیان دڵی دانەچڵەكیی و لە باوەڕە كەیان پەشیمان نەبوونەوە!

الجزء الثلاثون | سورة البروج

سُورَةُ البُرُوجِ — ترتيبها ٨٥ — آياتها ٢٢

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلْبُرُوجِ ﴿١﴾ وَٱلْيَوْمِ ٱلْمَوْعُودِ ﴿٢﴾ وَشَاهِدٍ وَمَشْهُودٍ
﴿٣﴾ قُتِلَ أَصْحَٰبُ ٱلْأُخْدُودِ ﴿٤﴾ ٱلنَّارِ ذَاتِ ٱلْوَقُودِ ﴿٥﴾ إِذْ هُمْ عَلَيْهَا
قُعُودٌ ﴿٦﴾ وَهُمْ عَلَىٰ مَا يَفْعَلُونَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ شُهُودٌ ﴿٧﴾ وَمَا نَقَمُوا۟
مِنْهُمْ إِلَّآ أَن يُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ﴿٨﴾ ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ
فَتَنُوا۟ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ ثُمَّ لَمْ يَتُوبُوا۟ فَلَهُمْ عَذَابُ جَهَنَّمَ وَلَهُمْ
عَذَابُ ٱلْحَرِيقِ ﴿١٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمْ
جَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْكَبِيرُ ﴿١١﴾ إِنَّ بَطْشَ
رَبِّكَ لَشَدِيدٌ ﴿١٢﴾ إِنَّهُۥ هُوَ يُبْدِئُ وَيُعِيدُ ﴿١٣﴾ وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلْوَدُودُ ﴿١٤﴾
ذُو ٱلْعَرْشِ ٱلْمَجِيدُ ﴿١٥﴾ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ ﴿١٦﴾ هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْجُنُودِ
﴿١٧﴾ فِرْعَوْنَ وَثَمُودَ ﴿١٨﴾ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى تَكْذِيبٍ ﴿١٩﴾ وَٱللَّهُ مِن
وَرَآئِهِم مُّحِيطٌۢ ﴿٢٠﴾ بَلْ هُوَ قُرْءَانٌ مَّجِيدٌ ﴿٢١﴾ فِى لَوْحٍ مَّحْفُوظٍۭ ﴿٢٢﴾

سُورَةُ الطَّارِقِ — ترتيبها ٨٦ — آياتها ١٧

والسماء والطارق | ٥٩٠

### یارانی كەلوو (ئوخدود) ستەمیان لە ئیمانداران كرد:

﴿[٤] قتل أصحاب الأخدود * [٥] النار ذات الوقود﴾ بە كوشت چن خاوەنانی لەغەمەكانی ئاگری بە سووتك, دەرەنجام خاوەن لەغەمەكان ئەوانەی بڕیاری ئەو لەغەمەیان دا نەفرینكران، ئەوەبوو خوای گەورە تۆڵەی لێسەندن ﴿[٦] إذهم عليها قعود﴾ كاتێ دانیشتبوون لە سەر لێواری لەغەمەكان, كەیفیان ئەكرد بەسووتاندنی موسڵمانەكان ﴿[٧]

وهم علی مایفعلون بالمؤمنین شهود﴾ وه ئەوان لـه سەر ئەوەی‌دەیانکرد بە بڕوادارەکان ئامادەبوون. مەبەست لەم داستانە وشیارکردنەوەی (قورەیش)ە، کە ئەگەر ئەوانیش دەست لـه ئەشکەنجەی موسڵمانەکان هەڵنەگرن خوا لەمیهرەبانی خۆی بێبەشیان ئەکات و ئەیان فەوتێنێ، لەملایشەوە دڵدانەوەی موسڵمانەکانە ﴿ ^٨ وما نقموا منهم إلا أن یؤمنوا بالله العزیز الحمید﴾ عەیبیان لێنەدۆزی بوونەوەو هیچ شتێکیان پێناخۆش نەبوو لێیان، ئەوە نەبێت کە باوەڕیان هێنابوو بەخوای دەسەڵاتداری سوپاسکراو ﴿ ^٩ الذی له ملك السموات والأرض﴾ ئەو خوایەی دەسەڵاتی ئاسمانەکان و زەوی هی ئەوە ﴿ والله علی کل شئ شهید﴾ ئەو وەخوا ئاگایشی بەسەر هەموو شتێکا هەیەو هیچی لێ ون نابێت، بە تایبەت ئەوانەی وا سزای موسڵمانان ئەدەن.

**تۆڵەی یارانی کەلوو:**

﴿ ^١٠ إن الذین فتنوا المؤمنین والمؤمنات﴾ بێگومان ئەوانەی کە پیاوانی بڕوادارو ژنانی بڕواداریان ئازارداو دژایەتیان کردن ﴿ ثم لم یتوبوا﴾ لە پاشا تەوبەشیان نەکرد ﴿ فلهم عذاب جهنم ولهم عذاب الحریق﴾ سزای دۆزەخ وسزای ئاگری سوتێنەریان بۆ هەیە ، چونکە ئەوانیش موسڵمانەکانیان دەسوتاند. ئینجا پاشەرۆژی موسڵمانەکان باس ئەکات: ﴿ ^١١ إن الذین آمنوا﴾ بێگومان ئەو کەسانەش بڕوایان هێنابوو ﴿ وعملوا الصالحات﴾ و کارە چاکەکانیان کردبوو ﴿ لهم جنات تجری من تحتها الأنهار﴾ لە بەهەشتدا چەندین باخیان بۆ هەیە وەلەبنکی درەختەکانیانەوەجۆگە لە ئاوو رووبارەکان دەڕۆن ﴿ ذلك الفوز الکبیر﴾ ئائەوەشە دەسکەوتی گەورە.

**هەڵمەتی پەروەردگار زۆر حەستەمە:**

پاشان خوای گەورە باسی دەست وەشاندنی خۆی دەکات لەدوژمنانی دینەکەی وەك ئەفەرمووێ: ﴿ ^١٢ إن بطش ربك لشدید﴾ بەڕاستیی دەست وەشانی پەروەردگارت زۆر توندو بەتینە ، هەرگیز مرۆڤ ڕزگاری نابێ لێی، ﴿ ^١٣ إنه هو یبدئ ویعید﴾ بەڕاستیی ئەو خوایەیە لەسەرەتاوە بێ بناغە خەڵکی دروست دەکات و، پاش مردن و نەمانیشی ئەیگێڕێتەوە بۆ ژیان و زیندووی ئەکاتەوە ﴿ ^١٤ و هوالغفور الودود﴾ وەهەر ئەویشە خوای لێبووردەی خاوەنی خۆشەویستی بۆ بەندە تەوبەکارو گوێرایەڵەکانی ﴿ ^١٥ ذو العرش المجید﴾ خاوەنی عەرشی گەورە ﴿ ^١٦ فعال لما یرید﴾ زۆر بەکارە هەرچی بیەوێ دەیکات کەسێك ناتوانێ بەرهەڵستی بوەستێ ﴿ ^١٧ هل آتاك حدیث الجنود﴾ ئایا هەواڵی لەشکرە سوپاکانت پێنەگەیشت؟ ﴿ ^١٨ فرعون و ثمود﴾ هۆزی فیرعەون و ثمود، و ئەوەی بەسەرهێنرا، ئەوەبو کە لەموسا یاخی بوو و خوای گەورەیش لەناوی بردن لەشکری سەمود گەلێ لەئێوە بەهێزتر بوون، ئەوەبوو سەرپێچیان کردو خوایش گرتنی، جا کەوابوو ئەی قوورەیش و هاوچەشنەکانیان ئێوەش ئاگادار بن، هۆشیار ببنەوە ئەگینا چیمان بەوان کرد، بەئێوەیشی ئەکەین ﴿ ^١٩ بل الذین کفروا فی تکذیب﴾ کافرەکانی قورەیش کەڵکیان لەو داستانانە وەرنەگرت، وەکو دەفەرموێ: بەڵکو ئەوانەی کافرو بێ بڕوا بوون لە هۆزەکەت لەبەدرۆ ناساندنێکی شێتگیرانەدابوون سەبارەت بەخۆت و بە قورئان ﴿ ^٢٠ والله من ورائهم محیط﴾ و خوایش لـه پشتیانەوە بە زانست و عیلمی خۆی دەوری گرتوون، و لەدەستی ڕزگار نابن ﴿ ^٢١ بل هو قرآن مجید﴾ وە نەبێ ئەوەی ئەوان دژایەتی دەکەن سەرگوزەشتەیەکی بێ ناوەڕۆك بێت، نا! بەڵکو قورئانێکی گەورەو زۆر بەرزو بڵندو پیرۆزە و هەرگیزیش ناتوانن خامۆشی بکەن ﴿ ^٢٢ فی لوح محفوظ﴾ لەتابلۆیەکی پارێزراودایە، واتە: پارێزراو دەست تێبردنی شەیاتین.

کۆتایی تەفسیری سوورەتی (بروج).

سوپاسی بێ پایانیش بۆ خوای گەورە.

٨٦ - سوورەتی (طارق) ە

مەککەییەو (١٧) ئایەتە

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتە چارەسەری چەند باسێك دەکات کە پەیوەندییان بەبیروباوەڕوعەقیدەوە هەیە بەتایبەت بڕوا بەزیندووبوونەوەو لێپرسینەوە، بۆیە چەندین بەڵگە لەسەردەسەلاتی خوا بۆ زیندووبوونەوە دێنێ، و دەڵێت: باشە ئەو زاتەی کەتوانیبێتی هەر لەسەرەتاوە ئادەمیی دروست بکات، ئایا هەر ئەوزاتە ناتوانێ هەرکاتێك بیەوێ زیندووی بکاتەوە؟ جالەسەرەتاوە بەسوێند بەو ئەستێرانە دەس پێدەکات کەبەشەوا دەرئەکەون و ئەدرەوشێنەوە بۆئەوەی مەردوم ڕێیان پێ دەربکەن لەتاریکەشەودا، سوێند دەخوات بەوانە کە هەموو مرۆڤێك فریشتە بەسەریەوە دانراوە بۆ پاراستن و چاودێریی کاروکردەوەی، پاشان چەند بەڵگەیەك بۆ توانایی پەروەردگار لەسەر زیندووکردنەوەی ئادەمیزاد باسدەکات، ئینجا دەرخستنی تەواوی نهێنییەکانی ئادەمیزاد لەدوارۆژدا لەکۆتاییدا باسی راستیی و دروستیی قورئان ئەکات کە: کۆمەڵە دەستوورێکی بەرزەو مایەی سەرکەوتن و پێشکەوتن و خۆشبەختیی هەردووجیهانە بۆگەلان، لەگەڵ باسی فڕوفێڵی بێ بڕواکانداو، پووچەڵ کردنەوەی فڕوفێڵە کەیان. وەبەم شێوەیەش دەست پێدەکات:

الجزء الثلاثون — سورة الطارق

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلسَّمَآءِ وَٱلطَّارِقِ ﴿١﴾ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلطَّارِقُ ﴿٢﴾ ٱلنَّجۡمُ ٱلثَّاقِبُ ﴿٣﴾ إِن كُلُّ
نَفۡسٖ لَّمَّا عَلَيۡهَا حَافِظٞ ﴿٤﴾ فَلۡيَنظُرِ ٱلۡإِنسَٰنُ مِمَّ خُلِقَ ﴿٥﴾ خُلِقَ مِن مَّآءٖ
دَافِقٖ ﴿٦﴾ يَخۡرُجُ مِنۢ بَيۡنِ ٱلصُّلۡبِ وَٱلتَّرَآئِبِ ﴿٧﴾ إِنَّهُۥ عَلَىٰ رَجۡعِهِۦ لَقَادِرٞ ﴿٨﴾
يَوۡمَ تُبۡلَى ٱلسَّرَآئِرُ ﴿٩﴾ فَمَا لَهُۥ مِن قُوَّةٖ وَلَا نَاصِرٖ ﴿١٠﴾ وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلرَّجۡعِ ﴿١١﴾
وَٱلۡأَرۡضِ ذَاتِ ٱلصَّدۡعِ ﴿١٢﴾ إِنَّهُۥ لَقَوۡلٞ فَصۡلٞ ﴿١٣﴾ وَمَا هُوَ بِٱلۡهَزۡلِ ﴿١٤﴾ إِنَّهُمۡ
يَكِيدُونَ كَيۡدٗا ﴿١٥﴾ وَأَكِيدُ كَيۡدٗا ﴿١٦﴾ فَمَهِّلِ ٱلۡكَٰفِرِينَ أَمۡهِلۡهُمۡ رُوَيۡدَۢا ﴿١٧﴾

سُورَةُ الأَعْلَىٰ — ترتيبها ٨٧ — آياتها ١٩

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحزب ٦٠

سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى ﴿١﴾ ٱلَّذِي خَلَقَ فَسَوَّىٰ ﴿٢﴾ وَٱلَّذِي قَدَّرَ فَهَدَىٰ
﴿٣﴾ وَٱلَّذِيٓ أَخۡرَجَ ٱلۡمَرۡعَىٰ ﴿٤﴾ فَجَعَلَهُۥ غُثَآءً أَحۡوَىٰ ﴿٥﴾ سَنُقۡرِئُكَ
فَلَا تَنسَىٰٓ ﴿٦﴾ إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۚ إِنَّهُۥ يَعۡلَمُ ٱلۡجَهۡرَ وَمَا يَخۡفَىٰ ﴿٧﴾ وَنُيَسِّرُكَ
لِلۡيُسۡرَىٰ ﴿٨﴾ فَذَكِّرۡ إِن نَّفَعَتِ ٱلذِّكۡرَىٰ ﴿٩﴾ سَيَذَّكَّرُ مَن يَخۡشَىٰ ﴿١٠﴾
وَيَتَجَنَّبُهَا ٱلۡأَشۡقَى ﴿١١﴾ ٱلَّذِي يَصۡلَى ٱلنَّارَ ٱلۡكُبۡرَىٰ ﴿١٢﴾ ثُمَّ لَا يَمُوتُ
فِيهَا وَلَا يَحۡيَىٰ ﴿١٣﴾ قَدۡ أَفۡلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ﴿١٤﴾ وَذَكَرَ ٱسۡمَ رَبِّهِۦ فَصَلَّىٰ ﴿١٥﴾

٥٩١

﴿بسم الله الرحمن الرحيم * [١] و السماء و الطارق﴾ سوێند بەئاسمان و، بەو ئەستێرانەی کە بە شەوا دەرئەکەون و، بەرۆژدا خۆیان ون دەکەن ﴿وما أدراك ماالطارق﴾ جا تۆ چۆن دەزانی (طارق) چیە، ئەگەر ئێمە پێت نەڵێین؟ ﴿النجم الثاقب﴾ ئەستێرەی ڕووناك کەرەوەیە، کە بەڕووناکی خۆی تاریکی شەو کون ئەکات ﴿إن كل نفس لما عليها حافظ﴾ سوێند بەوانە هەموو کەسێك چاودێرو ئاگادارێکی بەسەرەوەیە ،هەرچی بکاو، هەرچی بڵێت ئەینوسێت، کەوابوو بێداربن!.

**ئەم شێوە دروستبوونەی ئێستای مرۆڤ، بەڵگەی زیندووبوونەوەیەتی:**

﴿فلينظر الإنسان مم خلق﴾ جا بامرۆڤ تەماشا بکا لەچی دروستکراوە..؟ ﴿خلق من ماء دافق﴾ لەئاوێکی ملقەدەر دروست کراوە ﴿يخرج من بين الصلب والترائب﴾ لەنێوان بڕبڕەکانی پشتی (پیاو)و ئێسکەکانی سنگی (ژن)ەوە دەردەچێت ﴿إنه على رجعه لقادر﴾ بەڕاستی ئەو خوایە دووبارە بۆ دروستکردنەوەی زۆر بەتوانایەو، دەتوانێ زۆر بەئاسانی پاش مردنی وەك خۆی لێبکاتەوە، واتە: خوایە ئەوەندە دەسەڵاتی هەبێت کە ئابەو شێوەیە لەسەرەتاوە ئادەمزاد دروست بکات، ئەی چۆن لێینایەت دیسانەوە زیندووی بکاتەوە..؟!.

**كه قیامه‌ت دیٚ، ئینسان ده‌سه‌ڵات و پشتیوانی نییه :**

﴿[9] یوم تبلى السرائر﴾ له‌وڕۆژه‌دا(ڕۆژی قیامه‌ت) هه‌رچی ڕازو نیازو نهێنییه‌كانی دڵه ئاشكرا ده‌كرێت ﴿[10] فما
له من قوة ولا ناصر﴾ جاهیچ هێزو كۆمه‌ككارێكی نیه به‌ده‌میه‌وه بێت و ڕزگاری بكات.

**سوێندی خوا له‌به‌ر ڕاستیی قورئان:**

﴿[11] والسماء ذات الرجع﴾ سوێند به‌ئاسمانی خاوه‌ن باران كه‌جار بۆجار باران ده‌بارێنی بۆ مرۆڤه‌كان و
گیانله‌به‌ران ﴿[12] والأرض ذات الصدع﴾ وه‌به‌زه‌ویی كه درزو قڵیشی تێده‌بێت، واته: به‌فرمانی خوای خۆی قڵیش
ده‌بات و بۆ هه‌رگیایه‌ك بییه‌ویٚ سه‌ر ده‌ربێنیٚ ﴿[13] إنه لقول فصل﴾ به‌ڕاستی ئه‌و (قورئان)ه، وته‌یه‌كی جیاكه‌ره‌وه‌یه
ره‌وا له ناره‌وایه ﴿[14] وماهو بالهزل﴾ وه گه‌مه‌و شۆخیی نییه , واته: به‌بیٚ هوده نه‌نێنراوه، به‌ڵكو ده‌بیٚ بكرێته
به‌رنامه‌ی ژیانی‌هه‌ردوو دونیا ﴿[15] إنهم یكیدون كیدا﴾ بێگومان ئه‌و بیٚ باوه‌ڕانه فرت و فێڵ ئه‌كه‌ن بۆ كوژانه‌وه‌ی
نوری قورئان...!! ﴿[16] واكید كیدا﴾ وه منیش به فێڵ تۆڵه‌یان لێده‌سێنم. واته: له‌به‌رامبه‌ریه‌وه فێل و فه‌ره‌جی
ئه‌وانه‌وه منیش ورده ورده پلان و نه‌خشه‌ی خۆم ده‌خه‌مه‌كارو ئه‌یانگرم و له ده‌ستم ده‌رناچن ﴿[17] فمهل الكافرین﴾
جا تۆش ئه‌ی پێغه‌مبه‌ر! ﷺ په‌له له بیٚ باوه‌ڕه‌كان مه‌كه ﴿ امهلهم رویدا﴾ هه‌میسان كه‌مێك مۆڵه‌تیان بده‌و لێیان
بووه‌سته، جا بۆماویه‌كی‌تر به‌چاوی خۆت ئه‌بینی چیان پێده‌كه‌م، وه‌ك له‌ئایه‌تی تردا ئه‌فه‌رمویٚ: (نمتعهم قلیلا ثم
نضطرهم إلى عذاب غلیظ)٢٤/٣١. (نه‌سایی) له (جابیر)ه‌وه ده‌ڵێت: جارێكیان (موعاز) پێش نوێژیی نوێژی شێوانی
كرد و له‌نوێژه‌كه‌یدا هه‌ردوو سووره‌تی: (به‌قه‌ره و نیسا)ی خوێند! ئه‌و جا پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رمووی: (آفتان انت
یامعاذ!؟) مه‌گه‌ر تۆئه‌ی مه‌عاز! ئازارو ره‌نجه دڵی خه‌ڵكی ده‌ده‌یت؟! ئه‌ی بۆچی نه‌ئه‌كرا سووره‌تی: (طارق)،
سووره‌تی (شمس) و ئه‌وانه له‌باتی ئه‌و دوو سووره‌ته‌دا بخوێنیت؟

كۆتایی ته‌فسیری سووره‌تی (طارق).

ستاییش و سوپاس بۆ خوای كارزان.

*** *** ***

## ٨٧- سووره‌ی ئه‌علا یه

## مه‌ككه‌ییه‌و (١٩) ئایه‌ته

**به‌ناوی خوای ده‌هنده و دلۆڤان**

ئه‌میش به‌كورتی به ته‌نزیمی خوا ده‌ست پێده‌كات و سیفه‌ته جوانه‌كانی و، چه‌ند به‌ڵگه‌یه‌كیش له‌سه‌ر توانا و ده‌سه‌ڵاتی ئه‌و. هاتنی وه‌حی و قورئان بۆ پێغه‌مبه‌ر ﷺ، وه ئاسانكردنیشی بۆ له‌به‌ركردن. په‌ندو ئامۆژگاریی جوان و شیرین، دڵه زیندووه‌كان سودی لیٚ وه‌رده‌گرن. به‌م شێوه‌یه ده‌ست پێده‌كات.

**ته‌سبیحات و په‌سنی په‌روه‌ردگارت بكه :**

﴿ بسم الله الرحمن الرحیم*[1] سبح اسم ربك الأعلى﴾ به‌رده‌وام په‌روه‌ردگاری به‌رزو بڵندی خۆت به‌پاكی ناو ببه‌،
واته: به‌پاكی له‌هه‌ر كه‌م وكوریی و ناته‌واوییه‌ك ڕا بگره. پێشه‌وا (احمد) ده‌ڵێت: په‌یامبه‌ر ﷺ هه‌ركات ئه‌م ئایه‌ته‌ی
ئه‌خوێنده‌وه ئه‌یفه‌رموو: (سبحان ربك الأعلى). احمد ٢٣٢/١. ﴿[2] الذى خلق فسوى﴾ ئه‌و خوایه‌ی كه هه‌موو شتێكی
دروستكردووه، جا به‌جوانیش ڕێك وپێكی كردووه ﴿[3] والذى قدر فهدى﴾ ئه‌و زاته‌ی كه بۆ هه‌رشتێك شێوه‌ی
ژیانی تایبه‌تی خۆی دانا و ئه‌ندازه‌گیری كرد، ئینجا ڕێنمایشی كرد بۆ جۆری بژێوی خۆی، وه‌ك ئه‌فه‌رمویٚ: (قال

ربنا الذی أعطی كل شئ خلقه ثم هدی)٢٠/٥٠. له صه‌حیحی (موسلیم)دا هاتووه: ((إن الله قدر مقادیر الخلائق قبل أن یخلق السموات والأرض بخمسین ألف سنة وكان عرشه علی الماء)). مسلم ٢٠٤٤/٤. واته: بەڕاستی بەر لە دروست كردنی ئاسمانەكان و زەوی بەپەنجا هەزار ساڵ خوای گەورە ئەندازەگیریی هەموو ئەم دونیایە بەتەواوی نهێنیەكانی و كانگاو كانزاكانیەوە كردوون بۆ خزمەتی ئادەمیی و، تێشیگەیاندوون كە چۆن سوودیان لێوەرگرن، نەك هەرئادەمیی، بەڵكو تەنانەت مێروولەیش تا دەگاتە هەموو گیانلەبەرێكیتر لەشێوەی ژیانی خۆی ئاگادار كردووە، كەبەڕاستیی ئەوە بەڵگەیەكی گەورەیە لەسەر بوونی خوا ﴿ والذی أخرج المرعی ﴾ ئەو خوایەی كە لەوەڕگە، و گژو گیاو رووەك و هەمووجۆرە سەوزاییەكیتر دەردێنێت بۆ ئاژەڵەكان ئەوانیش بەپێی جۆریان سوودی لێوەردەگرن ﴿ فجعله غثاء أحوی ﴾ ئینجا پاش سەوزیی و جوانیی زەرد وەری دەگێڕێ و دەیكا بە پۆشێكی ڕەشباو.

## پێغەمبەر ﷺ هەرگیز وەحیی لەبیر ناچێ:

﴿ سنقرئك فلا تنسی * ٧ إلا ماشاء الله ﴾ ئەی موحەممەد ﷺ دڵنیابە ئێمە قورئانت لەڕێی جوبریلەوە پێدەخوێنین، جا تۆش غەمت نەبێت هەرگیز لەبیرت ناچێتەوە، مەگەر شتێك كە خوا خۆی ویستی لەسەر بێت و لە بیرتی بەرێتەوە بە نەسخكردنەوەی و لابردنی ﴿نه یعلم الجهر وما یخفی ﴾ بەڕاستیی ئەو ئاگادارە بەو شتانەی كە مرۆڤ بەئاشكراو نادیار ئەیكات ﴿ ونیسرك للیسری ﴾ و تەوفیقت دەدەین بۆ ئاسانترینی شەریعەتەكان، كە ئەویش ئەم شەریعەتی ئیسلامەیە ﴿ فذكر إن نفعت الذكری ﴾ ئینجا ئەگەر پەندو وەبیر خستنەوە كەڵكی هەبێ، پەند بدە بەقورئان و ئامۆژگاری مەردوم بكە. (عەلی كوڕی ئەبی تالیب) ﷺ چەند جوان دەڵێت: ئەگەر بەپێی ئەندازەی ئەقڵ و ژیری خەڵكی ئامۆژگاری نەكەیت، سەریان لێ تێكدەچێت، پێت خۆشە كەقسەیەكیان بۆ بكەیت و خواو پێغەمبەری خوا بەدرۆ بكەنەوە؟! كەوابوو دەبێ بزانیت لەكوێ قسە دەكەیت و، چیش دەڵێیت؟ ﴿ سیذكر من یخشی ﴾ ئەوكەسەی كە لەخوا بترسێ بێگومان پەندو سوود وەر ئەگرێ ﴿ ویتجنبها الأشقی ﴾ و بەدبەخت و كافر خۆی لائەدا لە ئامۆژگاری و ناچێ بەگوێیدا ﴿ الذی یصلی النار الكبری ﴾ واتە: ئەوەی دەچێتە ناو ئاگرە هەرە گەورەكەوە ﴿ ثم لایموت فیها ولا یحی ﴾ لەپاشا نەئەمرێ بۆ ئەوەی لەوێ ڕزگاری ببێ وەنە ئەیشژیی بەژیانێكی خۆش و ئاسوودە ئەم فەرموودەیەش كە پێشەوا (ئەحمەدو موسلیم) دەیهێنن هەر ئەو ڕاستییە دووپات ئەكەنەوە: (أما أهل النار الذین هم أهلها فإنهم لایموتون فیها ولا یحیون..) مسلم:١٧٣/١. واتە: بەڵام ئەوانەی واشیاوو خەڵكی ئاگرن و لەوێدا هەرگیز نامرن تاڕزگاربن، نایشژین بەخۆشی، وەئەم ئایەتەش: (ونادوا یامالك لیقض علینا ربك قال إنكم ماكثون)٤٣/٧٧. هەمان ماناو مەبەست دووپات دەكاتەوە.

## خەڵكی پاك كار ڕزگارە:

﴿ قد أفلح من تزكی * ١٥ وذكر اسم ربه فصلی ﴾ بەڕاستیی ئەو كەسە برەوە بوو خۆی پاك كردەوە لە شیرك و گوناهو تاوان و ناوی پەروەردگاری خۆی هێنا، جا نوێژی كرد، واتە: ئەوەی لەسەری فەرز كراوە لە پێنج نوێژەكان ﴿ بل تؤثرون الحیاة الدنیا ﴾ لەجیاتی ئەوەی ژیانی دوا ڕۆژ هەڵبژێن، كەچی ژیانی ئەم دونیایە هەڵئەبژێرن و پێشی ئەخەن بەسەر دواڕۆژدا ﴿ والآخرة خیر وأبقی ﴾ لەكاتێكا كە ژیانی ئەولازۆر چاكترو بەدەوامترە بۆتان لە ژیانی ئەم دونیایە ﴿ إن هذا لفی الصحف الأولی ﴾ بەڕاستیی ئەمەی باسكراوە لەم سورەتەدا لەنامە ئاسمانییە پێشووەكانیشدا هەیە.

**نووسراوەکەی ئیبراهیم و مووسا:**

﴿[١٩] صحف إبراهيم وموسى﴾ لە نامەکانی (ئیبراهیم و موسا) (سەلامی خوایان لەسەربێت. لەفەزڵ و گەورەیی ئەم سوورەتەدایە کە ئیمامی (موسلیم) و خاوەن (سنن)ەکان لە (نوعمانی کوڕی بەشیر)ـەوە دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ لەنوێژی جەژنەکان و ڕۆژی هەینییدا سوورەتی (الأعلى) و سوورەتی (الغاشية)ی دەخوێند، ئەگەر جەژن و هەینی بکەوتنایەتە یەك ڕۆژ، ئەو هەر دەیخوێندن، پێشەوا (ئەحمەد)یش لەخاتوونە (عایشە)وە دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ لەنوێژی (وەتر)دا سوورەتی: (الأعلى، الكافرون، الصمد)ی دەخوێند. خاتوو عایشە ئەمەشی بۆ زیاد کرد: (معوذتین)، واتە: (فەلەق و ناس)یشی دەخوێند.

کۆتایی تەفسیری سوورەتی (ئەعلا)

زۆرسوپاس بۆخوای گەورەو دلۆڤان.

*** *** ***



## ٨٨- سوورەتی ( غاشیه ) یه

## مەککەییەو ( ٢٦ ) ئایەتە

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

ئەم سوورەتە باس دەکات:

١- لە قیامەت و پلە دژوارو قورسەکانی، هاوکات لەگەڵ ئەوحاڵەتە زۆر ناڵەبارو ناهەموارەدا بەتایبەت کە تووشی مرۆڤە بێ بڕواکان ئەبێت، وە ئەو خێروخۆشیی و شادییەش بەموسڵمانان دەبڕێت.

٢- بەڵگەی هەمە جۆرە لەسەر تاك و تەنیایی خوای جیهانەکان، هەر لەدروستکردنی جۆری وشترو ئاسمانی پڕ لەشتی سەیرو سەمەرە، تائەگاتە زەویی و، کێوەکان دێنێتەوە، پاشانیش سەرنجی مرۆڤەکان رادەکێشێ بۆئەوەی کەپێش ئەوە بگەڕێنەوە لای خوا حیسابی بۆخۆیان بکەن. وە بەم شێوەیە دەست پێدەکات:

**قیامەت و حاڵی بەدحاڵی جەهەننەمی:**

﴿بسم الله الرحمن الرحيم *[١] هل أتاك حديث الغاشية﴾ ئایا دەنگ و باسی ڕۆژە داپۆشەرەکەت, واتە: قیامەت پێگەیشتووە؟ کە تەواوی خەڵك دادەپۆشێ و، کەسێك نیە لە نارەحەتی ئەو ڕۆژە دەرچێت ﴿[٢] وجوه يومئذ خاشعة﴾ لەو ڕۆژەدا ڕووخسار گەلێك زەبوون و زەلیلە ﴿[٣] عاملة ناصبة﴾ ڕەنجدەرێکی ماندوون، چونکە هەرچییان کردووە تەنها بۆ ژیانی دونیا بووە و، خوایان پشتگوێ خستووە، وائێستا هەر ماندووبوونیان بۆ دەمێنێتەوە ﴿[٤] تصلى نارا حامية﴾ دەڕۆنە ناو ئاگرێکی گەرمەوە ﴿[٥] تسقى من عين آنية﴾ وە لەکانی ئاوێکی زۆرگەرم و داخ و لەکوڵ ئاویان ئەدرێتێ! ﴿[٦] ليس لهم طعام إلامن ضريع﴾ هیچ خواردنێکیشیان نییە جگە درکێکی وشك و تاڵ و

تفت (كه مه‌گەر تەنها وشتر بیخوات)! ﴿٧ لایسمن ولا یغنی من جوع﴾ ئەویش نەئەوەیە گۆشتی پێبگرن و قەڵەویان بكا، نەئەوەیشە برسییەتیان لا بباو پێی بژین، بەپێچەوانەوەی خۆراكی دونیاوە.

**حاڵی قەشەنگ و ناوازەی بەهەشتییەكان:**

﴿٨ وجوه یومئذ ناعمة﴾ وە چەند روخسارو دەم و چاوێكی روو خۆش و گەشاهەن ﴿٩ لسعیها راضیة﴾ رازین بەپاداشی هەوڵ و كۆششەكەیان ﴿١٠ فی جنة عالیة﴾ لەناو بەهەشتێكی بەرزو بڵندان ﴿١١ لاتسمع فیها لا غیة﴾ هیچ قسەو وتەیەكی هیچ و پووچ و بێ مانای تیا نابیسن، وەك دەفەرموێ: (لا یسمعون فیها لغوا ولا تأثیما إلا قیلاً سلاما سلاما)٥٦/٢٥-٢٦. ﴿١٢ فیها عین جاریة﴾ بەدائیم سەرچاوەی رەوانی تێدایە، لەچەند لایەكەوە ئاوی خۆشقوت دێت و دەچێت. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((أنهار الجنة تفجر من تحت تلال – او من تحت جبال- المسك))/ابن حبان: ٢٦٢٢ (موارد الظمآن)، واتە: رووبارەكانی بەهەشت لەژێر چەند كێوو تەپۆڵكەیەكی میسكەوە هەڵدەقوڵێن ﴿١٣ فیها سرر مرفوعة﴾ هەروەها چرپاو سیستەم و چەند تەختێكی بەرزی بەنرخی ایێەو كورسی لەهەموو لایەكەوە بەدەوری كانیاوەكەدا ریزكراوە و (حور العین)ی لەسەر دانیشتووە ﴿١٤ وأكواب موضوعة﴾ و لەبەردەمیاندا پەرداخی جوان و نەخشین دانراوە ﴿١٥ ونمارق مصفوفة﴾ و پاڵە پشتی جوان و ڕازاوەی تیایە كە بە شێوەیەكی جوان وپەسەند ڕیز كراون ﴿١٦ وزرابی مبثوثة﴾ وە قاڵی و رایەخی رەنگاورەنگی تیا ڕاخراوە.

**بۆ ڕانامێننه وشترو عەرز و چیاكان؟!**

﴿١٧ افلا ینظرون إلى الإبل كیف خلقت﴾ ئایا بێ باوەڕەكان بەوردی تەماشای وشتر ناكەن، چۆن دروستكراوە؟ وشتر چەندە گیانلەبەرێكی گەورەو سەرسوڕهێنەرە، خواردنێكی سادەی هەیە، دڕكی وشتر خوار ئەخوات، دەتوانێ چەند رۆژێ ئاو نەخواتەوە، لەگەڵ ئەوەیشدا منداڵێك دەتوانێت یخی بدات و باری بكات و.. هتد ﴿١٨ و إلى السماء كیف رفعت﴾ و بۆ ئاسمان ناڕوانن چۆن بەرز كراوەتەوە؟ لە سوورەتی (٥٠/٦) دەفەرموێ: (افلم ینظروا إلى السماء فوقهم كیف بنیناها وزیناها وما لها من فروج؟) ﴿١٩ وإلى الجبال كیف نصبت﴾ و بۆشاخەكان ناڕوانن چۆن داكوتراون و لەناخی زەویی توند كراون؟ ﴿٢٠ وإلى الأرض كیف سطحت﴾ و تەماشای دەشتەكانی زەویی ناكەن، چۆن تەختكراوەو ڕاخراوە؟ جا خوایەكی بەدەسەڵاتی ئاوا بتوانێ ئەوهەموو شتانە دروست بكا ناتوانێ چی بوێت دروستی بكات لە بەهەشتدا؟ واتە:بێ شك ئەتوانێ.

**پێغەمبەر ﷺ هەر راگەیاندنی لەسەرە:**

﴿٢١ فذكر إنما انت مذكر﴾ ئینجا تۆیش ئەی موحەممەد! ﷺ ئامۆژگارییان بكە و ئەم شتانەیان بخەرەوە یاد، ئیتر گوێت لێ نەبێت، ئەیبیسن، یان نایبیسن چونكە تۆ لەم كاتەدا هەر ئامۆژگاریكەرێكی بۆیان ﴿٢٢ لست علیهم بمسیطر﴾ هیچ دەسەڵاتێكت نیە بەسەریانا تا بتوانی بەزۆر بڕوایان پێ بێنیت، یان كوشتاریان لەگەڵ بكەیت ﴿٢٣ إلا من تولى وكفر﴾ بەڵام ئەوەی كە پشت هەڵدەكاو كافر دەبێ ﴿٢٤ فیعذبه الله العذاب الأكبر﴾ خوا بەسزایەكی هەرە گەورەسزای دەدات ﴿٢٥ إن إلینا إیابهم﴾ بەڕاستیی گەرانەوەیان بۆلای ئێمەیە ﴿٢٦ ثم إن علینا حسابهم﴾ لەوەو دوایش بەڕاستی حیساب و لێپرسینەوەشیان هەر لەسەر خۆمانە كەس فریایان ناكەوێ و، ناتوانێ لەسزای سەخت ڕزگاریان بكات.

كۆتایی تەفسیری سوورەتی (غاشیه)..

زۆر سوپاس بۆ خوای زانا.

## ٨٩- سوورەتی ( فه جر )ـه

## مەككەییەو ( ٣٠ ) ئایەتە

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

ئەم سوورەتە باسی سێ شتی سەرەكی ئەكات:

یەكەم: داستانی هەندێ لەو گەلانەی بڕوایان بە پەیامبەرەكانیان نەهێنا وبەدرۆیان خستنەوە، وەك گەلی (عاد، سەمود، فیرعەون،) و ئەنجامی بێ بڕواییان.

دووەم: باسای خوای كار جوانە كەدەبێ گەلێ جار، ئادەمیی بە چەند جۆرێك تاقی بكاتەوە: بە خێرو بێر، شەڕو نەهامەت، دەوڵەمەندیی و، هەژاریی، هاوڕێ لەگەڵ باسكردنی سروشتی مرۆڤدا لەزیادە ڕەوییكردندا بۆماڵ و دارایی.

سێیەم: هاتنی ڕۆژی‌دوایی و بوونی ئادەمی بە دوو بەشەوە لەوڕۆژەدا: بەختیارو بێ بەخت، دەرەنجامیان و ئامادەبوونی دۆزەخ و، بیركردنەوەی ئادەمیی و پەشیمان بوونەوەی. ﴿بسم الله الرحمن الرحیم * [1] والفجر﴾ سوێند بە سپێدەی بەیانی ڕۆژی جەژنی قوربان ﴿[2] ولیال عشر﴾ وە بە دەشەوەپیرۆزەكەی سەرەتای مانگی حەج، پێغەمبەرﷺ دەربارەی فەزیلەت و گەورەیی ئەو دەشەوو ڕۆژەی سەرەتای مانگی زیلحیجەیە دەفەرموێ: ((ما من أيام العملُ الصالحُ أحب إلى الله فيهن من هذه الأيام، قالوا: ولا الجهاد في سبيل الله؟ قال: ولاالجهاد فی سبيل الله، إلا رجلا خرج بنفسه وماله ثم لم يرجع من ذلك بشئ))فتح الباری:٢/٥٢٠. ﴿[3] والشفع والوتر﴾ وەبە تاق وجوتی هەموو شتێ، یان سوێند بەخودی خوای گەورەو بەتەواوی گیانداران، یان سوێند بەڕۆژی جەژن و ڕۆژی عەرفە ﴿[4] واللیل اذا یسر﴾ وە بە شەوكاتێ بەرەو ڕۆژ بوونەوە دەڕواو تێدەپەڕێ كەبەڕاستیی ئەوەش ئاڵ وگۆڕكییەكی سەرسوڕ هێنەرە، چونكە سوڕانە وەی زەوی وەبیردێنێت ﴿[5] هل فیذالك قسم لذی حجر﴾ ئایا ئالەوانەدا سوێندێكی‌كافی نیە بۆ خاوەن ئاوەزێك؟ واتە: هەر كەسێك خۆی بە ژیر بزانێ دەبێ بیرێك لەوشتانە بكاتەوەو، بڕوا بە پەروەردگاریی خۆی بێنێ، جاسوێند بەمانە هەموو بێ بڕوایان بەتوندی سزا ئەدرێن.

**ئەمانە یاخیی بوون و، خوایش بەر قەمچی غەزەبی خۆی دان:**

﴿[6] الم تر كیف فعل ربك بعاد﴾ ئایا نە تدیت ئەی موحەممەد ﷺ كە پەروەردگاری تۆچۆنی كرد بەگەلی عاد كە(هود) ی بۆ ڕەوانە كردبوون. ﴿[7] ارم ذات العماد﴾ ئێرەم، باپیرەی عادی یەكەم،خاوەن پایەی بەرزو خانووو كۆشكی ستووندار﴿[8] التی لم یخلق مثلها فی البلاد﴾ ئەوقەومەی وێنەی دروست نەكرابوو لە سەر زەوی وشاراندا

سُورَةُ الفَجۡرِ — الجُزۡءُ الثَّلَاثُونَ

سُورَةُ الفَجۡرِ — ترتيبها ٨٩ — آياتها ٣٠

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلۡفَجۡرِ ١ وَلَيَالٍ عَشۡرٖ ٢ وَٱلشَّفۡعِ وَٱلۡوَتۡرِ ٣ وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَسۡرِ
٤ هَلۡ فِي ذَٰلِكَ قَسَمٞ لِّذِي حِجۡرٍ ٥ أَلَمۡ تَرَ كَيۡفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ
٦ إِرَمَ ذَاتِ ٱلۡعِمَادِ ٧ ٱلَّتِي لَمۡ يُخۡلَقۡ مِثۡلُهَا فِي ٱلۡبِلَٰدِ ٨
وَثَمُودَ ٱلَّذِينَ جَابُواْ ٱلصَّخۡرَ بِٱلۡوَادِ ٩ وَفِرۡعَوۡنَ ذِي ٱلۡأَوۡتَادِ ١٠
ٱلَّذِينَ طَغَوۡاْ فِي ٱلۡبِلَٰدِ ١١ فَأَكۡثَرُواْ فِيهَا ٱلۡفَسَادَ ١٢ فَصَبَّ
عَلَيۡهِمۡ رَبُّكَ سَوۡطَ عَذَابٍ ١٣ إِنَّ رَبَّكَ لَبِٱلۡمِرۡصَادِ ١٤ فَأَمَّا
ٱلۡإِنسَٰنُ إِذَا مَا ٱبۡتَلَىٰهُ رَبُّهُۥ فَأَكۡرَمَهُۥ وَنَعَّمَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّيٓ أَكۡرَمَنِ
١٥ وَأَمَّآ إِذَا مَا ٱبۡتَلَىٰهُ فَقَدَرَ عَلَيۡهِ رِزۡقَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّيٓ أَهَٰنَنِ ١٦
كَلَّاۖ بَل لَّا تُكۡرِمُونَ ٱلۡيَتِيمَ ١٧ وَلَا تَحَٰٓضُّونَ عَلَىٰ طَعَامِ
ٱلۡمِسۡكِينِ ١٨ وَتَأۡكُلُونَ ٱلتُّرَاثَ أَكۡلٗا لَّمّٗا ١٩
وَتُحِبُّونَ ٱلۡمَالَ حُبّٗا جَمّٗا ٢٠ كَلَّآ إِذَا دُكَّتِ ٱلۡأَرۡضُ دَكّٗا
دَكّٗا ٢١ وَجَآءَ رَبُّكَ وَٱلۡمَلَكُ صَفّٗا صَفّٗا ٢٢ وَجِاْيٓءَ يَوۡمَئِذِۭ
بِجَهَنَّمَۚ يَوۡمَئِذٖ يَتَذَكَّرُ ٱلۡإِنسَٰنُ وَأَنَّىٰ لَهُ ٱلذِّكۡرَىٰ ٢٣

٥٩٣

له هێزو دەسەڵات , کەچی لەگەڵ ئەوەیشدا کاتێ کەسەرپێچییان کرد لەناومان بردن و، هیچیشیان پێ نەکرا.. جاکەوابوو ئەی قورەیش ئێوەیش هۆشیاربن! ﴿[٩] وثمود الذين جابوا الصخر بالواد﴾ وەگەلی سەمود (ئوممەتی صالح)یشت نه بینی که لەنێوشیوو دۆڵەکاندا تاشه بەردیان دەبڕیی وخانوویان پێدروست دەکرد. نازانیت کاتێ سەرپێچییان کرد چیمان پێکردن؟ ﴿[١٠] وفرعون ذی الأوتاد﴾ وه فیرعەونی خاوەن سوپای زۆرت نەدی؟، چ کۆشك وبینایەکی وەك مێخ دا کوتی به زەوییدا هەبوو ﴿[١١] الذين طغوا فی البلاد﴾ ئەوانەی که لەوڵاتی خۆیاندا یاخی بوبوون و خەڵکیان چەوساندەوە.﴿[١٢] فاكثروا فيها الفساد﴾ خراپەو ستەمی زۆریان تیا کرد,چەوساندنەوەی گەل وخواردنی بەروبوومی وڵاتیان به لێشاو ﴿[١٣] فصب عليهم ربك سوط عذاب﴾ ئینجا دوای ماوەیەك پەروەردگاری تۆ به قامچی سزای دان و، سزای کرد بەسەریاندا، واته: بۆهەموو گەلێکیان وەك شیاوی خۆی سزای ناردەسەریان ﴿[١٤] إن ربك لبالمرصاد﴾ چونکه بێگومان پەروەردگاری تۆهەمیشه له کەمیندایه بۆیان، هەردەم ئامادەیه تۆڵەیان لێ بسێنێ وچاوی لێیانەوەیه.

**دارایی و نەدارایی تاقیکردنەوەی خوان:**

﴿[١٥] فأما الإنسان إذا ما ابتلاه ربه﴾ بەڵام مرۆڤی کافر و خوا نەناس (وەك عوتبه، ئوممەییه، ئوبەی)و نموونەی ئەوان کاتێ کەپەروەردگاری تاقی کردەوە به پێدانی ماڵ و دارایی﴿فأكرمه ونعمه﴾ جارێزی لێناو سەروەت و سامانی پێبەخشی ونعیمەت و بەهرەی بەسەردا ڕشت تا دەرکەوێ: سپڵه یه، یان سوپاسگوزار ﴿فيقول ربی اكرمن﴾ جا به بایبوونێکەوە دەڵێت: پەروەردگارم ڕێزی لێناوم له بەرئەوەی شایەنی ئەو بەهرەیەم بۆیه پێیداوم ﴿[١٦] واما إذا ما ابتلاه فقدر عليه رزقه﴾ بەڵام کاتێکیش تاقی کردەوە به تەنگانه جارۆزی لێگرتەوە ﴿فيقول ربی اهانن﴾ جا بەناگاییەکەوە دەڵێت: پەروەردگارم سووکایەتی پێکردوم! چونکه "وادەزانێ ڕێزی مرۆڤ به سامانەوەیه ﴿[١٧] كلا﴾ نەخێر هیچی وانیه ,چونکه خوا ماڵ و سامان بەهەموو کەسێ دەدات، چاك و خراپ، یان لێیاندەگرێتەوە.﴿بل لا تكرمون اليتيم﴾ بەڵکو ئێوه لەگەڵ ئەو هەمو بیره چەوتانەتان وئەو هەموو دەسەڵاتەی هەتانه ڕێزی هەتیو ناگرن ﴿[١٨] ولا تحاضون على طعام المسكين﴾ و یەکتریش لەسەرناندانی بێ نەواو هەژاران هەڵنانێن ﴿[١٩] وتأكلون التراث اكلا لما﴾ وەجگه لەوەیش میرات - بەشەرعیی و ناشەرعیی- کۆ دەکەنەوەو دەیخۆن! ﴿[٢٠] وتحبون المال حبا جما﴾ وه دارایشتان خۆش دەوێ به خۆشویستنێکی زۆر, بەجۆرێ ئابڕووی خۆتانی لەسەر دادەنێن" ﴿[٢١] كلا﴾ دەست هەڵگرن لەو کارانه ﴿إذا دكت الأرض دكا دكا﴾ کاتێ زەویی هەژێنرا به هەژان دوای هەژان , وەپاره پارەکرا و، شاخەکان یەکسان بوون و قیامەت پێش هات ﴿[٢٢] وجاء ربك﴾ وه لەو ڕۆژەدا پەروەردگارت هات بەهاتنێك شیاوی خۆی بێت. دوای ئەوه تکاو شەفاعەتی لادەکەن و خواش مۆڵەتی پێغەمبەرﷺ دەدات بۆ شەفاعەت، که (مقام المحمود)ە.

(شەنقیتی) ئەڵێ: مەسەلەی هاتنی خوای گەورە یەکێکه لەئایەتەکانی صیفات، وه هەروەها هاتن ودابەزین (النزول والإتيان) که لەئایەتی (٢١٠/بەقەرە)دا هاتووە وەك: (هل ينظرون إلا أن يأتيهم الله فی ظلل من الغمام والملائكة وقضى الأمر وإلى الله ترجع الأمور), بەزەقی هاتنی پەروەردگار دەسەلمێنێ و دەشڵێت: هەموو ئەمانه و سیفەتی (ئیستیوا/ الإستواء)، چوونیەکن، جا لەسەروی هەموویانەوە نووسیویەتی (إن جميع الصفات من باب واحد، أی أنها ثابتة لله تعالى على مبدأ: (ليس كمثله شئ..) على غير مثال للمخلوق، فثبت استواء يليق بجلاله على غير مثال للمخلوق، وكذلك هنا كما ثبت الإستواء، ثبت المجیء، وكما ثبت المجیء، ثبت النزول، والكل من باب

(ليس كمثله شيء) اى على ماقاله الشافعي‌ﷺ حيث يقول: نحن كلفنا بالإيمان، فعلينا أن نؤمن بصفات الله على مايليق بالله على مراد الله، وليس علينا ان نكيف، إذ الكيف ممنوع على الله سبحانه. بۆیه(بەندە)ش پێم ڕەوا نیە بێ بەڵگە لەڕاستە ماناکەی خۆی لایدەم و (تەئویل)ی بکەم ﴿والملك صفا صفا﴾ وە فریشتەکانیش لە گەڵی ڕیز ڕیز , وەهاتنی خوا بۆ بڕیاردان وداوەرییە لە نێوان بەندەکاندا, وە ئەمەش دوای ئەوەی کە خەڵکی داوا دەکەن لە پێغەمبەر تکایان بۆ بکات لە لای خوا.

### دۆزەخ هاتە پێش مرۆڤ وە بیر دێ:

﴿[٢٣] وجئ يومئذ بجهنم﴾ وە لەو ڕۆژەدا دۆزەخ دەهێنرێتە ڕوو بۆگومڕایان، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (يؤتى بجهنم يومئذ لها سبعون الف زمام مع كل زمام سبعون الف ملك يجرونها) مسلم:٢١٨٤/٤. واتە: ئەو ڕۆژە دۆزەخ دێنن وحەفتا هەزار ڕەشمەی هەیە، لەگەڵ هەر ڕەشمەیەکا حەفتا هەزار فریشتە ڕایدەکێشن ﴿يومئذ يتذكر الإنسان﴾ لەو ڕۆژە قورسەدا ئادەمیی هەرچی کردبێت بیری ئەکەوێتەوە وپەشیمان دەبێ لەسەر خراپەکانیی و پەند دەگرێ ﴿وانى له الذكرى﴾ وە لەکوێ پەندو ئامۆژگاری کەڵکی دەبێ بۆی؟ لەو ڕۆژەدا ﴿[٢٤] يقول ياليتنى﴾ بەئێش و خەفەتێکەوە دەڵێت: خۆزگە من ﴿قدمت لحياتى﴾ بۆ ئەم ژیانی پاشە ڕۆژەم شتێکم پێش خستبا لەدونیادا ﴿[٢٥] فيومئذ لا يعذب عذابه احد﴾ ئینجا لەو ڕۆژەدا سزایەك دەدات، هیچ کەسێك ناتوانێ سزای وابدات! ﴿[٢٦] ولا يوثق وثاقه احد﴾ و هیچ کەسێك ناتوانێ پێوەند بکات وەك پێوەندی خوا ﴿[٢٧] يا ايتها النفس المطمئنة﴾ وە لەسەرەمەرگدا بە نەفسی ئیماندار دەوترێت: ئەی گیان و ڕۆحی! ئارامبە بە یادو زیکری خوا ﴿[٢٨] ارجعى إلى ربك راضية مرضية﴾ بگەڕێوە بۆ لای پەروەردگارت، ئاوا کە ڕازیکردبوویت بەپاداشتی خۆیی و لێت ڕازی بووە بە هۆی ئەوەی پێشی خۆتت خستووە لە کردەوەی چاك ﴿[٢٩] فادخلى فى عبادى﴾ دەبچۆرە ناو گیانی بەندەصاڵحەکانمەوە ﴿[٣٠] وادخلى جنتى﴾ و بچۆرە بەهەشتە ڕازاوەکەمەوە کە ئامادەم کردووە بۆت، جا کەئەم ئایەتە هات (ئەبوبەکری صدیق) دانیشتبوو وتی: ماشاءالله چەندە جوانە! پێغەمبەر ﷺ فەرموی: دڵنیابە ئەمە بەتۆش دەگوترێت. الدر المنثور: ٥١٣/٨.

کۆتایی تەفسیری (فەجر).

*** *** ***

## ٩٠- سوورەتی ( بەلەد )

## مەککەییەو ( ٢٠ ) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

مەبەستی ئەم سوورەتە هەمان مەبەستی سورەتە مەککەییەکانی ترە وەکوو: چەسپاندنی بیروباوەڕو ئیمان بە یەکخواپەرستیی، بەڕۆژی پاداش و تۆڵە، ئەوەتە بۆ یەکەمجار سوێند دەخوات بەشاری مەککە کە نیشتگای پەیامبەرە ﷺ، پاشان باسی هەندێ لەبێ باوەڕە سەرکەشەکان دەکات کە ململانێی حەقیقەت و ڕاستییان دەکرد، باسێکی کورتی قیامەتیش دێت لەگەڵ ئەو بارە سەخت و قورس و ئاڵۆزانەیدا، کۆتاییشی دێت بەوە کە جیاوازییەکی زۆر هەیە لەنێوان پاداشی موسڵمانان و، تۆڵەی بێ باوەڕەکاندا، وە هەرگیز چوونیەك و یەکسان نین.

بەم شێوەیەش دەست پێدەکات: ﴿بسم الله الرحمن الرحيم * [١] لا اقسم بهذا البلد﴾ سوێند بەم شارە (پیرۆزەی مەککە)یە کە بەڕاستیی شارێکی بەرزو بەنرخە، کابەی شەریف و ڕووگەی موسڵمانانی تێدایە، (قورتوبی) ئەڵێ:

هەندێ دەڵێن: بێژەی (لا) لە(لاقسم)دا (صلة)یە، واتە زیادەیەو بۆ تەئکیدو دووپاتکردنەوەی سوێندەکەیە. شیاوی باسیشە لەسەرەتای هەر وشەو سورەتێکەوە رەوایە ببێ، چونکە قورئان هەندێکی پەیوەستە بەهەندێکی تریەوە، جا کەوابوو هەمووی یەك حوکمی هەیە، بۆیە وا دەبێ لە سوورەتێکدا شتێ باس دەکرێ کەچی وەڵامەکەی لەسوورەتێکی تردا دێت، وەك: (وقالوا یا أیها الذی نزل علیه الذکر إنك لمجنون) ٦/١٥. وەڵامی ئەمە لەسورەتی (القلم)دا هاتووە: (ماأنت بنعمة ربك بمجنون) جا کەوابوو مانای (لا اقسم) بەم شێوە دەبێ: بەدڵنیاییەکەوە سوێند ئەخۆم. ئەمە رای (ئیبن عەبباس و ئیبن جوبەیرو ئەبو عوبەیدەیە)، وە هەروەها نموونەی ئەمە لەشیعرە عەرەبییەکانیشدا زۆر هاتووە وەك دەڵێ:

تذکرت لیلی فاعترتنی صبابة * فکاد صمیم القلب لا یتقطع

﴿٢ وانت حل بهذا البلد﴾ ئەو شارەی کەتۆ نیشتەجێی تێیدا، واتە: بەبوونی تۆ لەوێ، مەککە شەرەفمەندترە ﴿٣ ووالد وما ولد﴾ وە بەهەموو باوك و رۆڵەیەك کەدێتەدی، وەك ئیبن جەریر وتوویەتی.

**مرۆڤ بە خەم و نارەحەتی بە دیهاتووە:**

﴿٤ لقد خلقنا الإنسان فی کبد﴾ سوێند بەوانە، بەحەقیقەت ئێمە ئادەمیمان لەجۆرەها رەنج و ئازاردا دروست کردووە، هەر لەو کاتەوە کە گیان دەکرێ بەبەریا تا ئەمرێ هەر لەنارەحەتی و رەنجدایە، کەوابوو تۆش ئارامت ببێ لەسەر گرێ و قۆرتەکانی ژیان لە رێگەی دەعوەو بانگەوازەکەتدا ﴿٥ أیحسب ان لن یقدر علیه احد﴾ ئایا ئەو ئینسانە پێی وایە کەهیچ کەسێك دەستی ناڕوا بەسەریا..؟! بۆیە وا نکوڵی و ململانێی زیندوو بوونەوە دەکات و ﴿٦ یقول اهلکت مالا لبدا﴾ ئەوئینسانە بەشانازییەوە دەڵێت: من سامانێکی زۆرم لە دوژمنایەتی موحەممەددا بەختکرد..! گوایا لەناو قورەیشدا شانازی بەو کار سەر شێتانەیەی ئەکات ﴿٧ ایحسب ان لم یره احد﴾ بۆچی وادەڵێت؟! ئایا پێی وایە کەهیچ کەسێك چاوی لێنەبووە و نەیبینیوە؟! ئەی بۆ نازانێ خوا ئاگاداریەتیی و تۆڵەی لێدەسێنێ ﴿٨ الم نجعل له عینین﴾ ئایا دوو چاومان پێ نەداوە، تا پێیان ببینێ..؟ ﴿٩ ولسانا وشفتین﴾ هەروەها زمانێك و دوو لێومان پێنەبەخشیوە؟!.

**مرۆڤ دەتوانێ خێرو شەڕ لێك بکاتەوە:**

﴿١٠ وهدیناه النجدین﴾ وە ئایا بۆ هەردوو رێگاکە (چاك و خراپ) رێنموونیمان نەکرد..؟ وەك ئەفەرموێ: (إنا هدیناه السبیل إما شاکرا وإما کفورا) ٣/٧٦. جائیتر لەمەڕ ئەم چاکانەوە بۆچی ئەوەندە سپڵەیە..؟! ﴿١١ فلا اقتحم العقبة﴾ خۆ لە هەورازو سەختی نەداوە ,واتە: نەیتوانی بەسەر ئەو کۆسپ و سەختانەدا زاڵ ببێ و.؟ لەباتی ئەوەی سامان لەدوژمنایەتی پەیامبەردا ﷺ بەخت بکات , بەوماڵەیە بەندەیەك بکڕێ و، ئازادی بکا؟ ﴿١٢ وما أدرك ما

الجزء الثلاثون — سُورَةُ البَلَدِ

يَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي قَدَّمۡتُ لِحَيَاتِي ﴿٢٤﴾ فَيَوۡمَئِذٖ لَّا يُعَذِّبُ عَذَابَهُۥٓ أَحَدٞ ﴿٢٥﴾
وَلَا يُوثِقُ وَثَاقَهُۥٓ أَحَدٞ ﴿٢٦﴾ يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفۡسُ ٱلۡمُطۡمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ٱرۡجِعِيٓ
إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةٗ مَّرۡضِيَّةٗ ﴿٢٨﴾ فَٱدۡخُلِي فِي عِبَٰدِي ﴿٢٩﴾ وَٱدۡخُلِي جَنَّتِي ﴿٣٠﴾

سُورَةُ البَلَدِ — ترتيبها ٩٠ — آياتها ٢٠

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

لَآ أُقۡسِمُ بِهَٰذَا ٱلۡبَلَدِ ﴿١﴾ وَأَنتَ حِلُّۢ بِهَٰذَا ٱلۡبَلَدِ ﴿٢﴾ وَوَالِدٖ وَمَا وَلَدَ
﴿٣﴾ لَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ فِي كَبَدٍ ﴿٤﴾ أَيَحۡسَبُ أَن لَّن يَقۡدِرَ عَلَيۡهِ
أَحَدٞ ﴿٥﴾ يَقُولُ أَهۡلَكۡتُ مَالٗا لُّبَدًا ﴿٦﴾ أَيَحۡسَبُ أَن لَّمۡ يَرَهُۥٓ أَحَدٌ
﴿٧﴾ أَلَمۡ نَجۡعَل لَّهُۥ عَيۡنَيۡنِ ﴿٨﴾ وَلِسَانٗا وَشَفَتَيۡنِ ﴿٩﴾ وَهَدَيۡنَٰهُ
ٱلنَّجۡدَيۡنِ ﴿١٠﴾ فَلَا ٱقۡتَحَمَ ٱلۡعَقَبَةَ ﴿١١﴾ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡعَقَبَةُ ﴿١٢﴾
فَكُّ رَقَبَةٍ ﴿١٣﴾ أَوۡ إِطۡعَٰمٞ فِي يَوۡمٖ ذِي مَسۡغَبَةٖ ﴿١٤﴾ يَتِيمٗا ذَا مَقۡرَبَةٍ
﴿١٥﴾ أَوۡ مِسۡكِينٗا ذَا مَتۡرَبَةٖ ﴿١٦﴾ ثُمَّ كَانَ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَوَاصَوۡاْ
بِٱلصَّبۡرِ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡمَرۡحَمَةِ ﴿١٧﴾ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡمَيۡمَنَةِ ﴿١٨﴾ وَٱلَّذِينَ
كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِنَا هُمۡ أَصۡحَٰبُ ٱلۡمَشۡـَٔمَةِ ﴿١٩﴾ عَلَيۡهِمۡ نَارٞ مُّؤۡصَدَةُۢ ﴿٢٠﴾

سُورَةُ الشَّمۡسِ — ترتيبها ٩١ — آياتها ١٥

وَالشَّمۡسِ وَضُحَىٰهَا ٥٩٤

العقبة﴾ وه تۆ چووزانیت ریگای هەوراز چییه..؟! ﴿[١٣] فك رقبة﴾ ئازادکردنی گەردنی کۆیلەیە کە. لەمەڕ ئازادکردنی بەندەدا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەرکەسێ گەردنی (بەندە)یە ئازاد بکات، ئەوا خوای گەورە لەبەرامبەر هەر ئەندامێکی ئەو بەندەوە، ئەندامێکی ئەمیش ئازاد دەکا لەئاگر، تا دەگاتە دەست بەدەست، پێ بەپێ، عەورەت بەعەورەت)، جا(عەلی کوڕی حوسەین) ﷺ وتی: ئەی سەعید! جا تۆ بەگوێی خۆتت لە (ئەبی هورەیرە) وە ئەمەت بیست؟ وتی: بەڵێ: ئەوجا ئەویش غولامێکی هەبوو لەڕێی خوا ئازادی کرد. بوخاری (فتح: ١٧٤/٥. موسلیم: ١١٤٧/٢. ﴿[١٤] او إطعام فی یوم ذی مسغبة﴾ یاخود خۆراك بەخشینە لەڕۆژێکی برسێتییدا ﴿[١٥] یتیما ذا مقربة﴾ بە هەتیوێکی خزم، چاکە لەگەڵ خزمی نزیکدا زۆر کارێکی پیرۆزو بەرزە، وەك ئەم فەرمووده: ((الصدقة علی المسکین صدقة، وعلی ذی الرحم اثنتان: صدقة وصلة)). یارمەتی و دەسگیرۆکردنی کەسێکی هەژارو بێ نەوا بەیەك خێرو صەدەقە دائەنرێ، بەڵام هاوکاریی و یارمەتیدانی خزم دوو جار خێرە، لەلایەکەوە هەم صەدەقەیە، لەلایەکی ترەوە مافی خزمایەتیت جێبەجێ کردووە. اخرجه احمد: ٢١٤/٤. دەربارەی بەزەییش ئەم فەرمووده هاتووە ((الراحمون یرحمهم الرحمن، إرحموا من فی الأرض یرحمکم من فی السماء))، واتە: هەمیشە بە بەزەیی بن لەڕووی زەوییدا ئەی خاوەن روحمان! ئەوجا خوای (رەحمان) یش رەحم و میهرەبانیتان لەگەڵ دەکات. ئەبوداود: ٢٣١/٥. یان ئەم فەرموودەیە: ((من لم یرحم صغیرنا ویعرف حق کبیرنا فلیس منا)). واتە ئەوکەسەی وا لەگەڵ بچووك و کەم تەمەنانی ئێمەدا رەحم ناکاو، قایەل بە پلەو هەق و مافی (گەورە)کانمان نابن ئەوە لەئێمە نین!. ئەبوداود: ٢٣٢/٥ ﴿[١٦] او مسکینا ذامتربة﴾ یا بەکەسێکی کەوتەکار و خاك نیشین؟ کە لەهەژارییدا پەکی کەوتووەو کونوفت بووە. کەوابوو دەبێ هەوڵی جیددی بدرێت بۆ بنەبڕ کردنی بەندە و کۆیلەکان، وە لەگەڵ خەڵکانی کەم ژیانیشدا هەردەم دەس بەکارو بەبەزەیی بین. ﴿[١٧] ثم کان من الذین آمنوا﴾ لە پاشا ئەوەی ئەو بارە سەختەی هەڵ گرت، واتە: بەندەی ئازاد کردو، نانی بەهەژاردا لەو کەسانەش بوو ئیمانیان هێنابوو ﴿وتواصوا بالصبر﴾ وە وە صیەتیان بۆ یەکتر دەکرد بە صەبرو خۆراگرتن لەسەر بڕواو خواپەرستیی ﴿وتواصوا بالمرحمة﴾ وەوە صیەتیشیان بۆ یەکتر دەکرد بە بەزەیی و میهرەبانی لە نێوان خۆیا ن و خەڵکیدا ﴿[١٨] اولئك اصحاب المیمنة﴾ ئائەوانە کە ئەو سیفەتە جوانانەیان تێدایە یارانی لای راستن، واتە: بەختەوەرو بەهەشتین و خوا لێیان رازیە ﴿[١٩] والذین کفروا بآیاتنا﴾ وە ئەو کەسانەش کە کافر بوون بە ئایەتەکانمان ﴿هم اصحاب المشئمة﴾ ئا ئەوانە یارانیلای چەپن، واتە: بەد فەڕو دۆزەخین، نەگبەت و سەرلێشێواون، خەشمی خوایان لەسەرەو نامەی کردەوەکانیان بەدەستی چەپیانەوە ئەدرێ ﴿[٢٠] علیهم نار مؤصدة﴾ سەرەڕای ئەوەش دەرگای ئاگرێکی گەورەیان لە سە داخراوە، واتە: نە هەوای لێ دەردەچێت، وە نەدێتە ژووریێ. سا خوای گەورە بەمیهرەبانی خۆی لەو ئاگرە ڕزگارمان بکا، بمانباتە نێو ریزی یارانی لای راستەوە.

کۆتایی تەفسیری سوورەتی (بەلەد).

لەگەڵ سوپاسدا بۆ خوای میهرەبان.

*** *** ***

## ٩١- سوورەتی ( شەمس )ـە

## مەککەییەو ( ١٥ ) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتە گرنگی و بایەخ بەدووشتی زۆر گرنگ دەدات:

یەکەم: نەفس و دەروونی ئادەمیی،چونکە خوای کارزان بەجۆرێ بەدییهێناوە توانای وەرگرتنی خێرو شەڕ، رێنومایی و گومڕایی هەیە، دەتوانێ صالّح بێت، دەشتوانی لاسارو لاڕێ بێت.

دووەم: سەرکێشی و یاخیبوونی گەلەکەی (سەموود) ئوممەتەکەی صالّح پێغەمبەر. جالەسەرەتاوە خوای گەورە سوێند بەحەوت شت دەخوات: بەخۆرو روناکییەکەی، بەهەیڤ و بە رۆژ، ئەودەمە کە خۆر دەردەخا, وە بەشەو ئەوحەلە کە خۆر دائەپۆشێ, وە بەعاسمان و، خوا خۆی کە دروستیکردووە,وە بەزەویی، کە بۆژیانی ئادەمیی راخراوە،بە رۆح و نەفس، کە خوای گەورە صیفاتی تێروتەواوی پێ بەخشیوە.. سوێند بەوشتانە دەخوا کە: ئەگەر ئادەمیی لەخوا بترسێت ئەوا سەرفرازو بەختیار دەبێت، هەر کاتێکیش یاخیی بوو، ئەوا بەدبەخت و شەرمەزار دەبێت، ئەوجا داستانی گەلەکەی (سەموود)یش باس دەکات کەچۆن چوون بەگژ پەیامبەرەکەیاندا و، یاخیبوون و، وشترەکەیان پەلکردو کوشت، و چۆن دەرەنجامیش خوا کردنی بەپەندی زەمانەو لەناوی بردن و، لەکەسیش نەترسا. جا کەوابووئێوەش ئەی مەردم! وامەبن، ئەگینە وەك ئەوان دووچار دەبن.

سُورَةُ الشَّمْسِ — الجزء الثلاثون

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا ﴿١﴾ وَالْقَمَرِ إِذَا تَلَاهَا ﴿٢﴾ وَالنَّهَارِ إِذَا جَلَّاهَا ﴿٣﴾
وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَاهَا ﴿٤﴾ وَالسَّمَاءِ وَمَا بَنَاهَا ﴿٥﴾ وَالْأَرْضِ وَمَا طَحَاهَا
﴿٦﴾ وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا ﴿٧﴾ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا ﴿٨﴾ قَدْ
أَفْلَحَ مَنْ زَكَّاهَا ﴿٩﴾ وَقَدْ خَابَ مَنْ دَسَّاهَا ﴿١٠﴾ كَذَّبَتْ ثَمُودُ
بِطَغْوَاهَا ﴿١١﴾ إِذِ انْبَعَثَ أَشْقَاهَا ﴿١٢﴾ فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ
نَاقَةَ اللَّهِ وَسُقْيَاهَا ﴿١٣﴾ فَكَذَّبُوهُ فَعَقَرُوهَا فَدَمْدَمَ
عَلَيْهِمْ رَبُّهُمْ بِذَنْبِهِمْ فَسَوَّاهَا ﴿١٤﴾ وَلَا يَخَافُ عُقْبَاهَا ﴿١٥﴾

سُورَةُ اللَّيْلِ — ٩٢ — ٢١

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَىٰ ﴿١﴾ وَالنَّهَارِ إِذَا تَجَلَّىٰ ﴿٢﴾ وَمَا خَلَقَ الذَّكَرَ وَالْأُنْثَىٰ ﴿٣﴾
إِنَّ سَعْيَكُمْ لَشَتَّىٰ ﴿٤﴾ فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَاتَّقَىٰ ﴿٥﴾ وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَىٰ ﴿٦﴾
فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَىٰ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَنْ بَخِلَ وَاسْتَغْنَىٰ ﴿٨﴾ وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَىٰ
﴿٩﴾ فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَىٰ ﴿١٠﴾ وَمَا يُغْنِي عَنْهُ مَالُهُ إِذَا تَرَدَّىٰ ﴿١١﴾ إِنَّ عَلَيْنَا
لَلْهُدَىٰ ﴿١٢﴾ وَإِنَّ لَنَا لَلْآخِرَةَ وَالْأُولَىٰ ﴿١٣﴾ فَأَنْذَرْتُكُمْ نَارًا تَلَظَّىٰ ﴿١٤﴾

٥٩٥

**سەموود پێغەمبەرەکەی بە درۆ دەخاتەوەو تیادەچێ:**

﴿بسم الله الرحمن الرحيم * [1] والشمس وضحاها﴾ سوێند بەخۆروو، بە تیشك و رووناکیەکەی لە سەرەتای رۆژەوە، کە تاریکی لەت دەکاو بوونەوەر درەخشان دەبێ ﴿[2] والقمر إذا تلاها﴾ و سوێند بەمانگیش کاتێ بە شوێن خۆردا دێ و دنیا ڕووناك دەکاتەوە ﴿[3] والنهار إذا جلاها﴾ و سوێند بەڕۆژ، کاتێ قورسی خۆری تیا دەردەخاو دنیا ئەدرەوشێتەوە ﴿[4] والليل إذا يغشاها﴾ وسوێند بەشەویش، کاتێ بەتاریکییەکەی خۆر دادەپۆشێ، کەبەڕاستیی ئەو کاتانە کاتی ورد بوونەوەیە لەدەسەلاتی خوا ﴿[5] والسماء وما بناها﴾ و سوێند بەئاسمان و بەو زاتەش کە زۆر بەوردیی و بەقاییمی عاسمانی دروستکردووە،وەکو دەفەرموێ: (والسماء بنيناها بأيد وإنا لموسعون) ﴿[6] والأرض وما طحاها﴾ و سوێند بەزەویی و، بەو زاتەش کە بەدەسەلاتی خۆی ئەوی بەشێوەی هێلکەیی بەدیهێناوەو رایخستووە ﴿[7] ونفس وما سواها﴾ و سوێند بە نەفس و دەروونی مرۆ،بەو زاتەی دروستیکردووە بە ڕێك و پێکی ﴿[8] فألهمها فجورها وتقواها﴾ ئینجا ئیلهامی بەدکاریی و پارێزگاریی بۆ کرد، واتە: خێرو شەڕی بۆ روونکردەوە ,

وەنیشانیدا چی چاکە بیکاو چی خراپە نەیکاو خۆی لێبپارێزێ، خوا سوێندی خوارد بەو حەوت شتە بۆ ئەوەی گەورەیی خۆی لەوانەدا ببینرێتەوە، لەولایشەوە هەرکامێکیان حسێب بکەی پڕە لەخێرو چاکە. (ئیبن عەباس) دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ هەمیشە کە دەگەیشتە ئەم ئایەتەی: (ونفس وما سواها فألهمها فجورها وتقواها)، هەڵوێستەیەکی دەکردوو ئەیفەرموو:((اللهم آتِ نفسي تقْواها، انتَ وليُّهاومولاها، وخيرُ مَنْ زكّاها)) تەبەرانی: ١١/ ١٠٦. ئیمامی (ئەحمەد)یش لەمە درێژتر ریوایەتی کردووە:٢٧١/٤. ﴿[٩] قد افلح من زكاها﴾ سوێند بەوانە هەموو بێشك رزگاری بوو ئەوکەسەی کە نەفسی خۆی لەهەرچی کاری بەدوو فەسادە پاك و پوختەی کردەوە ﴿[١٠] وقد خاب من دساها﴾ و بەراستیی ئەو کەسەش کە نەفسی خۆی بەگوناح و تاوان ئالوودە کرد، نائومێدو ناموردا بوو.

## پاشەرۆژی گەلی ثمود:

﴿[١١] كذبت ثمود بطغواها﴾ سەموودی ئوممەتی صالح پەیامبەر سزای (طەغوا)یان بەدرۆ زانی ﴿[١٢] إذانبعث اشقاها﴾ ئەو دەمە کە بەپەلە نەگبەتترینیان (قەداری کوڕی سالیف) هەستایە سەرپێ بۆ کوشتنی وشترەکە ﴿[١٣] فقال لهم رسول الله ناقة الله وسقياها﴾ ئینجا پەیامبەرەکەی خوا (صالح) عليه السلام پێیگوتن: خۆتان لە ئەزیەتدانی وشترەکەی خواو، ئاو خواردنەوەکەی بپارێزن، دەست مەهێننە ڕێی، لەسەرە ئاوی خۆیدا. بەڵێ.. سەموود تیرەیەکبوون لە عەرەب، خوا پەیامبەرێکی بەناوی (صالح)ـەوە بۆ ناردن، جا لەسەر داوای خۆیان، خوا وشترێکی کردە موعجیزە بۆیان و پێیان وترا: واز لەو وشترە بێنن بابۆخۆی بلەوەڕێ و، ئێوەیش شیرەکەی بخۆن و،ئەو نۆرە ئاوێکی ببێ و، ئێوەش رۆژە ئاوێکتان ببێ، و هیچتان زیانی پێمەگەیەنن ﴿[١٤] فكذبوه﴾ کەچی بروایان بە صالح نەکرد و بەدرۆزنیان دانا ﴿فعقروها﴾ و وشترەکەشیان کوشت! ﴿فدمدم عليهم ربهم بذنبهم فسواها﴾ پەروەردگاریان بەهۆی گوناح و سەرپێچییانەوە ولاتیانی کاولکردو کوتانی بەسەریەکداو، لەگەڵ خاك یەکسانی کردن و، هەموو وەك یەك دووچار بوون، و کەسیان رزگاری نەبوو، واتە: ئەگەرچی تەنها کەسێکیان بوو هەستا وشترەکەی کوشت، بەڵام لەبەر ئەوە کە ئەوانی تریان رێیان لەوکارەدزێوە نەگرت، دەستی ئەو کابرایەیان نەگرت، خوایش بێ جیاوازیی لەنێوان گەورەو بچووك وهەژارو دەوڵەمەندیاندا لەناوی بردن، لەم سورەتە گەورەو پرمانایەدا وەردەگیردرێ کە دەبێ موسڵمانان هەموویان یەك دەست و یەك دڵ و یەك بۆچوون بن بەرامبەر بە رووداوو خراپکاران، وەنابێ رێ بەتاوانباران بدرێ تا دنیا وێران بکەن، ئەوانیش لەدوورەوە تەماشا بکەن، ئەگینا خوا پەی دەرپەی بەڵایان بۆ ئەنێرێ.

**چیەیەك:** ئەم سورەتە ئەگەر کەسێك ئاژەڵ و حەیوانێکی بەنرخی نەهاتبایەتەوە ئەوا دەرگایان بەخوێندەواری ئەو گوندە دەگرت و ناچاریان دەکرد کە دەمی گورگی لێ ببەستێ! ئەویش بەناچاری چەقۆیەکی ئەهێناو یەك دووجار سوورەتی (شەمس)ـی بەسەرا ئەخوێندو دەمی چەقۆکەی ئەنوقانەوە، ئیتر بەوحسابە دەمی گورگی لێدەبەسرا! ﴿[١٥] و لا يخاف عقباها﴾ وە ئەو (خوایە) لە دەرەنجامی پاشەرۆژی ئەو کارەشی ناترسێت، واتە: وەك پاشایەکی دنیا کە لەپاشەرۆژی کارەکانی خۆی دەترسێت، ئەو هەرگیز ناترسێ، چونکە خوا باڵادەستی نیە.

کۆتایی تەفسیری سوورەتی (شەمس).

زۆر سوپاس بۆ خوای کار دروست و لەکارزان.

*** *** ***

## ٩٢- سوورەتی ( لەیل )ـە

## مەککەییەو ( ٢١ ) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

خواسوێند ئەخوات بەشەو کاتێ کە هەموو شتێ دادەپۆشێ، بەرۆژ کاتێ کە جیهان رووناک دەکاتەوەو دەردەکەوێ، بەو خوا گەورەیەی نێرو مێی لەهەموو شتێکدا دروستکردووە.. سوێند دەخوا بەوانە هەموو کە: هەوڵی ئادەمیی لەیەك ناچێو جیاوازە، هەر بۆیەش ئەنجامی لەیەك ناچێ، ئینجا رێی بەختیاریی و، بەدبەختیی و ئەنجامی هەردووکیان رۆشن دەکاتەوە، چاککاران بۆ بەهەشت، بەدکارانیش بۆ دۆزەخ، پاشان ئادەمیی هۆشیار دەکاتەوە کە دەبێ ماڵ و سامانەکەی لەڕێی هەق و ڕاستیی کوێری نەکات، چونکە لەو رۆژەدا هیچ شتێ فریای ناکەوێ، لەکۆتاییدا نموونەی پیاوێکی چاك و صالح دێنێتەوە کە: چۆن ماڵ و سامانی خۆی لە رێی خێردا بەخت دەکردو تەنها بۆ مەبەستی رەزامەندی خواو، بەو مەبەستە کە خۆی لەچروکی و رژدی پاك بکاتەوە، جا وەك نیمچە ئیجماعێکی موفەسیرینی لەسەرە کە ئەو پیاوە صالح و کارچاکە یە(ئەبوو بەکر)ە ﵁، ئەوبوو هەر لەبەر رەزامەندی خوا (بیلال) و چەندان کۆیلەی کڕیی و، پاشان ئازادی کردن.

### هەوڵی مرۆڤ و ئەنجامەکەی:

خوای خاوەن بەزەیی هەر لەسەرەتاوە مرۆڤ هوشیار دەکاتەوەو هانی دەدات بۆ بەدەستهێنانی کاری چاك و پیرۆز، چونکە پاشە رۆژو ئەنجامیش هەر بەپێی هەوڵ و تێکۆشانەکانی دنیایە، بۆیە دەفەرموێ:﴿بسم الله الرحمن الرحیم * [١] واللیل إذا یغشی﴾ سوێند بەشەو کاتێ بە بەتاریکی خۆی رۆژ دادەپۆشێ، ئەوجا گەورەیی خواش زیاتر دەردەکەوێ ﴿ [٢] والنهار إذا تجلی﴾ و سوێند بەرۆژ کاتێ بەهۆی قورسی خۆرەوە دەردەکەوێ و جیهان روون دەکاتەوە ﴿ [٣] وما خلق الذکر والأنثی﴾ و بەو زاتەی کەنێرو مێی دروستکرد، کە ئەوەش ئەوپەڕی دەسەڵاتە کەلەو ئاوە کزو لاوازە هەڵقوڵاوە، نێرومێ جیا دەکاتەوە و، گش پەسن وصیفاتی جسن و رەگەزی هۆزوخێڵی خۆی هەڵدەگرێت، لەجێگایەکی تردا دەفەرموێ: (وخلقناکم أزواجا).﴿ [٤] إن سعیکم لشتی﴾ سوێند بەوگشت شتە جیاوازانە، بێگومان کارو تێکۆشانی ئێوەش ئەی مرۆڤ هەروا جیاوازو جۆراو جۆرە، هەتانە هەوڵەکانی بۆ بەدەستهێنانی بەهەشتە، هەیشتانە هەردەم هەوڵیەتی بۆ ئەنجامدانی کاری لاڕێی و لاساریی و دنیای حەرام ویاساغ ﴿ [٥] فأما من أعطی﴾ ئینجا ئەوەی ماڵ و سامانی خۆی لەبەر خوا بەخشی ﴿واتقی﴾ و لەنافەرمانی خوا خۆی پاراست ﴿ [٦] وصدق بالحسنی﴾ و بڕوای بە پاداشتی چاکتر کرد ﴿ [٧] فسنیسره للیسری﴾ ئەوا ئێمەش بێگومان بۆ بەهەشت و بۆ کاری ئاسان و چاك ئامادەو رێنوینی دەکەین، دەخەینە سەر راستە رێ ﴿ [٨] وأما من بخل واستغنی﴾ و ئەوەش چرووکی کردو خۆی بێ نیاز گرت ﴿ [٩] وکذب بالحسنی﴾ و بڕواشی بەپاداشی چاکتر نەکرد لەلای خوا ﴿ [١٠] فسنیسره للعسری﴾ ئەوا ئێمەش کار ئاسانی بۆ دەکەین، بۆ دژوارترین رێگە. (ئیبن عەباس) دەڵێ: ئەم ئایەتە سەبارەت بە (ئومەیە)ی کوڕی (خەلەف)هات. ﴿ [١١] وما یغنی عنه ماله إذا تردی﴾ ئەوکاتەش کە دەمرێ و فڕێدەدرێتە دۆزەخەوە، هەرگیزیش ماڵ و سامانەکەی هیچ کەڵکی پێ ناگەیەنێت و فریای ناکەوێت. (ئەبو بەکری صدیق) ﵁ گوتی بەپێغەمبەر ﷺ: ئایا ئێمە کار بۆ شتێکی ئەزەلی و بڕاوەو قەرار لەسەر دراو دەکەین؟ یان بۆ شتێکی نوێ و ئایندە؟ فەرمووی: ((بل علی أمر قد فُرغ منه)). نەخێر، ئێوە بۆ شتێك کار دەکەن کە لای خوا

ئەنجامەکەی براوتەوە! گوتی: جا کەوابوو ئیتر کاری چی بکەین؟ فەرمووی: ((کُلّ میسّر لما خُلق له)). واتە: هەرکەس بۆچی دروستکرابێ کاریش بۆئەوە دەکات. پێشەوا ئەحمەد/١/٥.

**دۆزینەوەی ڕێی ڕاست هەر بە دەست خوایە:**

دەبێ ئینسان بزانێت کە خێرو شەڕ، حەڵاڵ و حەرام،گش بەدەس خوایەو بڕیاری ئەوی دەوێ، بۆیە دەفەرموێ: ﴿[١٢] إن علینا للهدی﴾ بە ڕاستیی ڕێنوێنی و ڕوونکردنەوەی ڕێبازی ڕاست و دروست هەر لەسەر خوایە ﴿[١٣] و إن لنا للآخرة والأولی﴾ و بێگومان ئەو دنیاو ئەم دونیاش، واتە: هەردوو جیهانەکە هەر بۆ ئێمەیە، هەر لای خۆمان وە دەست دێن و لەهەر جێگایەکی‌ترەوە هەوڵیان بۆ بدرێت دەست ناکەون، کەوابوو هەمووکاتێکیش ڕوو هەر لەخۆمان بکەن.



**دۆزەخ هەر کەللە ڕەقانی تێدەچێت:**

﴿[١٤] فأنذرتكم نارا تلظی﴾ جا من ئێوەم ئاگادار کردووە (لەسەر زمانی پێغەمبەر ﷺ) بەئاگرێك دەسووتێ گر دەسێنێ، پێغەمبەری خوا وتاری دەخوێندەوە دەیفەرموو: ((إن أهْوَن أهل النار عذابا یوم القیامة رجُل تُوضعُ في أخْمص قدمیْه جمْرتان یغْلي منهما دماغُه))فتح الباري: ١١/٤٢٤. واتە: بێگومان سووکترین سزا بۆ خەڵکانی جەهەنەمی ڕۆژی قیامەت، سزای پیاوێکە دوو پشکۆ دەخرێنە ژێر هەردوو پاژنەی پێیەوەو، مێشك و دەماخی پێیان دەکوڵێ! ﴿[١٥] لا یصلاها إلا الأشقی﴾ ناچێتە ناویی و ناسووتێ بە هەمیشەیی، بەدبەخت و چارە ڕەش نەبێ ﴿[١٦] الذی كذب وتولی﴾ ئەوەی باوەڕی بە ئایەتەکانی خوا نەکردوو بەدرۆی زانین و پشتی لەئیمان و باوەڕ کرد. (ئیبن عەباس) دەڵێ: مەبەست بەو کەللە ڕەق و بەدبەختەی ئەم ئایەتەی: (لا یصلاها إلا الأشقی)یە، (ئومەیە) و (ئەبوو جەهل) و هەر کافرێکی تر ئەوە سیفەتی بێت.

**خواناسانی پارێزکار لەدۆزەخ وەدوور دەبن:**

﴿[١٧] وسیجنبها الأتقی﴾ دڵنیاشبن خەڵکانی پارێزکار و خواناس لەوە دوور ئەخرێنەوە ﴿[١٨] الذی یؤتی ماله یتزکی﴾ ئەوەی ماڵ و سامانی خۆی دەبەخشێت بەوە خۆی لە چرووکی و ڕژدی ﴿[١٩] وما لأحد عنده من نعمة تجزی﴾ و هیچ کەسێك چاکەیەکی لەلا نیە، ئەم لەجیاتی ئەوە پاداشتی بداتەوە ﴿[٢٠] إلا ابتغاء وجه ربه الأعلی﴾ بەڵام کە ئەوە دەکا مەبەستی تەنیا ڕەزامەندی پەروەردگاری باڵایەتی. زۆرێکی زۆرینەی ڕاڤەکەرانی قورئان دەڵێن: ئەم ئایەتەش لەمەڕ ئیمامی (ئەبوبەکر)ـەوە هاتۆتە خوارەوە، چونکە ئەوکەسە کە لەو دەمەدا هەڵسا بەبەخشین و بەختکردنی ماڵ و سامان بۆ ئازادکردنی بیلال هەر ئەوبوو ﴿[٢١] و لسوف یرضی﴾ و بەڕاستی ئەوکەسە لە ئاییندەدا

رازی دەبێت. واتە: خوای گەورە لەپاشەڕۆژدا ئەوەندە پلەو پایە دەبەخشێت بەئیمامی (ئەبوبەکر)، هەتاڕازیی و خۆشنوودی دەکات.

کۆتایی تەفسیری سوورەتی (لەیل).

*** *** ***

## ٩٢- سوورەتی (زوحا)یە

## مەککەییەو (١١) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتە باسی شەخصییەت و کەسێتی پەیامبەر ﷺ دەکات، لەسەرەتاوە سوێند دەخوا بە قەدرو پایەوپلەو ڕێزی ئەو پەیامبەرە ﷺ و، دڵنیاشی دەکات کە خوای باڵادەست هیچ سات وکاتی وازی لێنەهێناوەو، کین وخەشمی لێ نیە، وەك هاوبەش دانەرەکان پێیان وایەو کردوویانە هەرا، ئیمامی (بوخاریی)ش ئەو مانایەی بەجوانی لێکداوەتەوەو هێناویەتی، فتح الباری: ١٧/٣. ڕاڤەیکردووە، لەپاشانیش مژدەی دەداتێ بەپاداش و بریتیەکی زۆرو فراوان لەرۆژی قیامەتدا، و پێیشی دەڵێت کە هەر شتێکی لێ داوا بکات , پێیدەبەخشێ. ئینجا هەندێ لەحاڵەت و قۆناغەکانی منداڵیخۆی، وەك قۆناغی هەتیویی و، هەژاریی و، ڕێگا دەر نەکردنی وەبیر دێنێتەوەو، لە کۆتاییشدا سێ وەصیەتی بۆدەکا ﷺ:

١- هەرگیز بەهەتیودا هەڵ نەشاخێیت، چونکە خۆت هەتیوبوویتە وچاك دەزانی کات و زەمانی بێ باوکیەتی چۆنە.

٢- لەگەڵ هەژاراندا بەسۆزو میهرەبانبە، چونکە خۆت هەژار بوویتە.

٣- لەگەڵ بێ نەواو کەنەفت و پەککەوتەکاندا هەمیشە باش و چاکبە: (فأما اليتيم فلا تقهر...).

### بێ شك بە کەهەرگیز خوا دەست لە تۆ بەرنادا:

بەڵێ پاش ئەو هەموو هەراو قاڵەی قورەیشە کە گوایاخوا دەسی لە پێغەمبەر هەڵگرتبێت، خوا دەفەرموێ:﴿بسم الله الرحمن الرحيم * [١] والضحى﴾ سوێند بەهەڕەتی هەڵهاتنی خۆر (چێشتنگاه)، کە کاتی هەموو جم و جووڵ و ئیش و کارو چالاکیەکە، دەمی بزووتن وجولانەوەی هەموو شتێکە بۆژیان وخۆرزگار کردن لەچنگی دنیاخۆران ﴿[٢] والليل إذا سجى﴾ وە بەشەو, کاتێ ئارامی گرت وچڕو پڕبوو و، تاریکییەکەی، هەموو شتێکی داپۆشی و زرنگایەوە، دیارە ئەو ئاڵ و گۆڕە نیشانەی دەسەڵاتی خوایە، بۆیە لە سوورەتێکی تردا دەفەرموێ: (والليل إذا يغشى والنهار إذا تجلى). ﴿[٣] ما ودعك ربك وما قلى﴾ بەوانە سوێن، لەو کاتەوە پەروەردگارت هەڵی بژاردوویت دەستبەردارت نەبووەو نەیبووغزاندوویت ئەی پێغەمبەر!.

ئیمامی (بوخاریی) لە (جوندب)ـەوە دەگێرێتەوە (جبريل)بۆ ماوەیەك لە هێنانی وەحی دواکەوت, ئینجا موشریکەکان وتیان:دیارە خوا دەست بەرداری موحەممەد بووە! ئەوجا خوای باڵا دەس سوورەتی (والضحى والليل إذا سجى ماودعك ربك وماقلى)ی دابەزاند. موسلیم.

### رۆژی سەلات لەم دنیایە باشتردەبێ:

بەڵێ ئەم دنیایە، بۆ کەس بەقای نیە، بۆیە پێغەمبەران و پەیرەوانیان دوای نەکەوتوون و چاویان هەر لەقیامەتەوە بووە، بۆیە خوای دلۆڤان بەپێغەمبەر دەفەرموێ:﴿[٤] وللآخرة خير لك من الأولى﴾ بێگومانبە ئەو

ئەو دنیا چاکترە بۆت لەم دنیای یەکەمە، ئێستایش ئایینەکەت رۆژ لەدوای رۆژ بەپایان دەگات، هەربۆیە دوای ئەو ئامۆژگاریەی خوایە، پێغەمبەر دنیای زۆر بەکەم سەیر دەکردو شێوەی ژیان و حەوانەوەی زۆر سادەبوو، (عبداللەی کوڕی مەسعوود) دەڵێ: لەسەر حەسیر - کەلەپووشی خورما گیرا بوویەوە - رادەکشاو، بەقەبەرغەیشیەوە جێگای دیاربوو، منیش بۆم دەتەکان و پێمدەگوت: ئەریٰ بۆ شتێك نەخەین بەسەر حەسیرەکەدا هەتا بە قەبرغەتەوە دیار نەبێت؟ فەرمووی: ((مالی وللدنیا، إنما مَثلی ومَثلُ الدنیا کراکِبِ ظلّ تحت شجرة ثم راحَ وتَرکَها))احمد:١/٣٩١. واتە: من چیمە بەسەردنیاوە؟ چاك بزانن کە نەقڵی من و دنیا وەك ئەو سوارە وایە لەسێبەری درەختێکدا دەحەوێتەوەو، پاشان هەڵدەسێ و بەجێی دێڵێت، کەوابوو ئێوەش ئەی ئوممەتی ئیماندار! ئەوەند پشت بەدنیاوە مەبەستن. ﴿٥ ولسوف یعطیك ربك فترضی﴾ وە لەئایندەداو لەرۆژی بەرێدا، پەروەردگارت ئەوەندە نیعمەتت پێدەبەخشێت تۆ پێی رازی بی و، دڵی پێخۆش بکەیت،(واتە:مەقامەلمەحموودی) دەداتیٰ و شەفاعەت وتکابۆگشت ئوممەتەکەیدەکاو، خواش لێی وەردەگرێت.

## بەخششەکانی خوا بۆ پێغەمبەر ﷺ:

خوای میهرەبان هەندیٰ لە بەخششەکانی خۆی وەبیر پێغەمبەر دێنێتەوە، بۆ ئەوە پتر شوکرانە بژێر بیٰ و، چاویشی لە خەڵکی هەژارو بەئەنواوەوە بێت، بۆیە دەفەرمویٰ:﴿٦ ألم یجدك یتیما فآوی﴾ ئایاخوای پەروەردگارت بەهەتیویی نەیدیتی و، خێرا پەناو داڵدەی نەدایت و نەحەوایتەوە.

بەڵێ.. کاتیٰ باوکی کۆچی کرد، ئەم هێمان لەزکی دایکیابوو، وەهێمان شەش ساڵانەشبوو دایکیشی کۆچی دوایی کردو درایە دەستی باپیرەی، پاشان تەمەنی هەشت ساڵ بوو، ئەمیش دنیای بەجێهێشت و مامی گرتییە لایخۆی ﴿٧ ووجدك ضالا فهدی﴾ ئەی نەشارەزانەبوویت، خوا شارەزاو رێنووینی کردییت؟ ﴿٨ ووجدك عائلا فأغنی﴾ ئەی بە هەژارو دەستکورتی و نەداریی نەیدیتی؟ دەوڵەمەندی کردیت و بژێوی پێبەخشیت و،لەولاشەوە شوکرانە بژێر بوویت لە هەردوو حاڵەتەکەدا؟ خۆی -ص- دەفەرمویٰ: ((لَیس الغنَی عن کثرة العَرَض، ولکن الغنی غِنی النَّفْس)) متفق علیه.یان دەفەرمویٰ: ((قد أَفْلَحَ مَنْ أسْلَمَ ورُزِقَ کَفافا وقنّعَهُ اللّهُ بماآتاه)) موسلیم.

## رێز لە بەخششەکانی خوا بگرە؟:

﴿٩ فأما الیتیم فلا تقهر﴾ جاکەواتە (تۆش ئەی موحەممەد!) قار لە هەتیو مەگرە،چونکە تۆ خۆیشت هەتیوو بیٰباب بوویت ﴿١٠ وأما السائل فلا تنهر﴾ و هەرگیزیش بەسوالکەردا هەڵمەشاخیٰ و مەیتارێنە،هەرچۆن ببیٰ، چونکە تۆ خۆیشت نەدارو هەژار بوویت و خوا دەوڵەمەندو بیٰ نیازی کردیت، وەیان ئەر نەشارەزایەك داوای رێنمایی کرد،تۆش ئاسانکاری بۆ بکەو هاریکارییبە، وەکو خۆت رێت دەر نەدەکردو خوا رێنمایی‌کردیت ﴿١١ وأما بنعمة ربك فحدث﴾ وە ئەمما بە چاکەی خواوەندت(واتە: بە پێغەمبەرێتیی و هەر نیعمەتێکە تر) باس بکە بۆ خەڵك، واتە: سوپاسی خوا بکە لە سەر نیعمەتی پێغەمبەرێتی و غەیری ئەویش بە سەر خۆتەوە، چونکە باسکردنی نیعمەتی خوا شوکرو سوپاسگوزاریە بۆ خاوەنی نیعمەت کە خوایە.

بەڵێ.. بەڕاستیی پەیامبەر ﷺ لەماوەی ژیانییدا بەردەوام ئەو سێ قۆناغەی هەر لەیاد بوو، بەڵکو زۆر جاران خۆی بێ شێو سەری دەنایەوەو، ئەیبەخشی بە خەڵکانی هەژارو هەتیوان و لێقەوماوان.

کۆتایی تەفسیری سوورەتی (زوحا).

*** *** ***

## ٩٤- سوورەتی (ئینشراح)ـە مەککەییەو (٨) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتە باسی قەدرو پلەوریزو حورمەتی پەیامبەر ﷺ بەلای خوای گەورەوە دەکات، هەروەها باسی گەلێ نیعمەت و بەهرەکانی خوای بۆئەکا کە پێی بەخشیبوو، وەك گوشاد کردنی سنگیی، رووناککردنەوەی دڵی بەحیکمەت وناسینی خواو پاکژ و خاوێن کردنەوەی لەگوناح و تاوان.. ئەوەش هەموو بۆدڵدانەوەی پێغەمبەرە، تاچاکتر بتوانێ لەمەڕ ئەزیەت و ئازارو ئەشکەنجەی قورەیشدا خۆی رابگرێ، پاشان باسی بەرز راگرتنی پلەوریزی دەکات لەدنیاو لەقیامەتدا، هەروەها چۆن ناوی پیرۆزی ئەو بەرامبەر بەناوی بەرزو بڵوندی خوای گەورە دانراوە، وەك ئەفەرموێ: (ورفعنا لك ذكرك) ئەم دڵدانەوەو باسکردنەی پلەی بەرزی ئەوە لەکاتێکدا یە کەئەوهێمان لەمەککەدا ئەشکەنجە سزا ئەدرا، تا بەو وەبیرهێنانەوە تاڵاوو حاڵەتە تەنگییەکانی لەبیر بباتەوەو، سەرکەوتن و پیرۆزی بدات بەگوێیدا: (فإن مع العسر يسرا * إن مع العسر يسرا) لەکۆتاییشدا یادی پەیامبەر دەخاتەوە کەپاش ئەوەی پەیامەکەتت گەیاند، دەبێ هەرسوپاسگوزاری خوای خۆت بکەیت و لەئەنجامدانی گش کارێکی خێر وچاکدا نەوەستیت: (فإذا فرغت فانصب، وإلى ربك فارغب).

### سینەگوشادی پێغەمبەر و پلەو پایەو ناوو شۆرەتی:

پاش ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆری قورەیش و، رێگتن لەبڵاو کردنەوەی پەیامە جوان و شیرینەکەی و، خەم وخەفەتێکی زۆر لەوپێناوەدا، خوای میهرەبان دڵی دەداتەوەو ماندو نەبوونی دەکاو پێیدەفەرموێ ﴿بسم الله الرحمن الرحيم * [1] الم نشرح لك صدرك﴾ ئەی پێغەمبەر! ﷺ ئایا سینگمان بۆت گوشاد نەکردیت بە هیدایەتکردنت بۆ ئیسلام؟. وەك خوا لە سوورەتی(ئەنعام)دا دەفەرموێ:(فمن يرد الله ان يهديه يشرح صدره للإسلام) ﴿[2] ووضعنا عنك وزرك * [3] الذي انقض ظهرك﴾ ئەوەی پشتتی قورسکردبوو دامان نەگرت لە کوڵی ئازارو خەمەکەت؟ پەیامبەرﷺ زۆر خەفەتبارو دڵگران بوو، بەڵام خوای گەورە دڵی فەرەح و گوشاد کرد، تا لەبەرامبەر گەیاندنی ئەو پەیامە پیرۆزەیەوە ئارام بگرێ، سەرەنجامیش هەر پیرۆز بوو و ناوی لەهەموو جیهاندا دەر کرد، وەك ئەفەرموێ: ﴿[4] ورفعنا لك ذكرك﴾ وە ناومان بۆبەرز نەکردیتەوە لەناو جیهانەکاندا، جا ئەبێ چ ناوێك لەوە بەرزتربێت کە هیچ کەسێ بەموسڵمان دانەنرێ، هەتاپاش شایەتیدان بەخودی خوا، گەواهیش بەپەیامبەرێتیئەو بدات وبگوترێ: (...وأشهد أن محمدا رسول الله) ﴿[5] فإن مع العسر يسرا﴾ جابەڕاستیی لەگەڵ تەنگانەدا خۆشیی وئاسانیەك هەیە ، کەوابوو لەئاییندەیەکی نزیکدا دڵتەنگیی وبێزارییت دەبێتە گوشادیی و فەرەح و سەرکەوتنت ﴿[6] إن مع العسر

يسرا﴾ بـه راسـتی لـه گـەڵ تەنگانـەدا دیسـانەوە بـۆت دووپـات دەکەمـەوە: خۆشـیی و ئاسـانکاریەك هەیە. کەوابوو دڵقاییم و پشت ئەستووربە کەخوای گەورە بەزوویی دەرووی خێرت لیدەکاتەوەو سەرت ئەخات، بەڵێ سووننەت و باوی خوایە هەرگەلێك، یان هەر کەسێك باری ژیانی دنیای لەسەر تەنگ بووبێ و بزووتبێ و هەوڵی خۆ ڕزگار کردنی دابێت، ئەوا خوای گەورەیش سەری خستووە و دەرووی خێری لێکردۆتەوە ﴿٧ فإذا فرغت فانصب﴾ جاکاتێ لەکارێك بوویتەوە (ئەی موحەممەد ﷺ)، ڕاستەوەبە بۆ ئەنجامدانی کارێکیتر، چونکە پلەکانی سەرکەوتن و مەردایەتی لەدونیاو لە قیامەتدا بێ ژمارەو بێ سنوورن، بۆیە پێویستە مرۆڤ هەرکاتێ لە کارێکی خێروچاك بوویەوە زوو بەزوو دەست بداتە کارێکی تر و، بێوچان لەخزمەتی دینی ئیسلامدا تەکان بدات، بەتایبەتی پێغەمبەران و پەیڕەوانیان ﴿٨ وإلى ربك فارغب﴾ وە هەمیشە لەپەروەردگارت بلاڵێوە. چونکە هەر ئەوە وەڵامی داخوازیەکان دە (ئیبن کەسیر) دەڵێت: هەرگا لەکاروباری دونیات بوویتەوە، بەچالاکانە هەستە و پەلامار بدە بۆ خواپەرستیی و هیچ ئەندێشەیەکی دنیات لەلا نەمێنێ، بۆ پشتگیری لەو مەبەستە ئەم فەرموودەیەی هێناوە: ((لاصلاة بحضرة الطعام، ولا هو يدافعه الأخبثان)) موسلیم: ١/٣٩٣. یان دەفەرموێ: ((إذا أقيمت الصلاةُ وحضر العشاءُ فابدءوا بالعَشاء)) فتح الباري: ٩/٤٩٨.

واتە: کاتێ خواردن هاتە پێشێ و نان ئامادەکراو کاتی نوێژیش بوو، بچۆ نانەکەت بخۆو ئەوجار بەدڵێکی ساف و خاڵی لەهەر خەیاڵێك ڕوو لەخوا بکە.

کۆتایی سوورەتی (ئینشیراح).

٩٥- سوورەتی (تین)ە

مەککەییەو (٨) ئایەتە

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتە باسی دوو شتی زۆر گرنگ دەکات:

یەکەم: ڕێز لێنانی خوای میهرەبان لەئادەمزاد.

دووەم: بڕواهێنان بەڕۆژی حیساب و تۆڵە، وە لەسەرەتاوە سوێند ئەخوات بە ڕێ و شوێنە پیرۆزەکان، ئەوانەی جێگای نیگاو وەحی بوون، وەك (بەیتولمەقدیس)، کێوی طور، شاری مەککە، شوێند دەخوا کەخوا ڕێزی لەبەرەی ئادەمیی ناوەو، لەجوانترین شێوە قەدو بەژن باڵای دروستکردووە، کەواتە دەبێ سوپاسی ئەویش بکات، ئەگینا پەست و ڕیسوا و زەلیل دەبێ، پاشان لۆمەی بێ بڕواکان دەکات لەسەر ئەوە کەبڕوا ناهێنن بەزیندوو بوونەوە..

لەکۆتاییشدا باسی دادگەریی و دادپەوەری خوادەکات بەپاداشدانەوەی موسڵمانان و، تۆڵەدانی بێبڕوایان، دیارە هەر کەسە بەپێی شیاوی خۆی.

مرۆڤ لە ڕێکترین شێوەدا بەدیهێنراوە:

بەم شێوەیەش دەست پێدەکا: ﴿بسم الله الرحمن الرحيم * ١ والتين والزيتون﴾ سوێند بەداری هەنجیرو زەیتوون، یان بەو جێگایەی کە هەنجیرو زەیتوونی تیاسەوز ئەبێ واتە: شاری قودسی پیرۆز جێگای لەدایك بوونی عیسا ﷺ ﴿٢ وطور سنين﴾ وەبەو کێوە پیرۆزە کەخوا لەوێ لەگەڵ موسادا وتووێژی کرد (لەدەشتی سینا) ﴿٣ وهذا البلد الأمين﴾ وە سوێند بەم شارە هێمن و ئاسوودەیە، واتە: شاری مەککە کە کابەی پیرۆزی تێدایە ﴿٤ لقد خلقنا

الإنسان﴾ سوێند بە هەموو ئەمانە، بێشك ئێمە ئادەم و نەوەیمان دروستكرد (فی احسن تقویم) لەجوانترین ڕێكی قەدو باڵاو شێوەدا ﴿ثم رددناه أسفل سافلين﴾ پاشان كە باوەڕی نەهێنا گێرامانەوە بۆ نزمترین پلەی ئاژەڵانی لە خواری خوارەوەن لە پلەو نرخدا، واتە: لە بەر ئەوە كە سوپاسی خوای نەكرد و یاخیبوو، بەوە خۆی بردە ڕیزی ئەوانەوە بەسروشت ژیرنین، دەرەنجامیش چووە دۆزەخەوە ﴿إلا الذين آمنوا﴾ غەیرەز ئەوانەی بڕوایان هێنا ﴿وعملوا الصالحات﴾ و چاكەكانیان كرد ﴿فلهم أجر غير ممنون﴾ جا ئەوانەپاداشتێكی نەبڕاوەیان بۆهەیە، وە بەپەست ونزم دانانرێن و دەچنە بەهەشتەوە ﴿فما يكذبك بعد بالدين﴾ جا ئیتر چ شتێك وات لێدەكات - ئەی ئینسان! پاش ئەو بەڵگەو نیشانانە لە سەر تواناو قودرەتی خوا لە سەر زیندووبوونەوە باوەڕ بە حیساب نەكەیت و بەدرۆی بزانی؟ ﴿أليس الله بأحكم الحاكمين﴾ ئایا خوا لەهەموو داوەرەكان داوەرتر نیە؟! بەڵێ لەهەمووداوەرێك داوەرتر ودادپەروەرترە، چونكە ئادەمزاد بۆ ئەوە دروستكراوە ژیریی خۆی بخاتە گەڕ بۆ دۆزینەوەی خوا، جا كاتێ ئەوخۆی گێل و كوێر كرد، ئەوا ئیتر ڕەوایە پەستترین پلەی بدرێتێ و ببرێتە ڕیزی پەستترین گیاندارەكانیشەوە بشنێردرێ بۆ دۆزەخ. لە گەورەیی و فەزیلەتی سوورەتی (تین)ە كە: (بەڕای كوڕی عازیب) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە ركاتێكی نوێژی سەفەردا، سوورەتی (تین)ی دەخوێند.. فتح الباری: ٥٨٣/٨. مسلم: ٣٣٩/١.ئیمامی (ترمزیی)- لەئەبو هورەیرەوە- دەگێڕێتەوەو دەڵێ: هەركەسێ سوورەتی (والتين والزيتون)ی خوێند و گەیشتە كۆتا ئایەتی: (أليس الله بأحكم الحاكمين)دەبێ بڵێ: ((بلى، وأنا على ذلك من الشاهدين)) ئەبوداود: ٥٥٠/١.هەرچەند ئەم فەرموودیە (سەنەد)ەكەی لاوازە، چونكە یەكێك لەڕاویەكانی نادیارەو ناو نەبراوە، بڕوانە كتێبی: (القول المبين في أخطاء المصلين)ل٢٣٩. چاپی چوارەم ساڵی (١٤١٦هـ - ١٩٩٦م).



كۆتایی تەفسیری سوورەتی(تین) لە گەڵ سوپاس و حورمەتدا بۆ خوای میهرەبان.

كۆتایی تەفسیری سوورەتی(تین).

*** *** ***

## ٩٦- سوورەتی ( عەلەق )ـە
## مەككەییەو ( ١٩ ) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سورەتە بەكورتە لەچەند شتێك دەدوێ:

یەكەم: سەرەتای هاتنی وەحی بۆ پەیامبەر ﷺ.

دووەم: یاخیبوونی ئادەمزاد بەهۆی ماڵ و دارایییەوە.

سێیەم: داستانی بەدبەختەكەی قورەیش (ئەبوجەهل) و ئەزیەت و ئازارەكەی بۆ پەیامبەر ﷺ بەو شێوەیە كە پێشەوا (موسلیم) لە(صەحیح)ـەكەیدا (٢٧٩٢/٢) دەیهێنێ.

جا بۆ یەكەمجار باسی بەهرەو میهرەبانیەكانی خوا دەكات بەرامبەر بەپەیامبەر كەچۆن بەو شێوە ناوازەیە قورئانی بۆ ناردووەتە خوارەوە، لەكاتێكا كەئەو هێمان، لەئەشكەوتی (حراء)دا لە خەڵوەتا بوو" بەڵێ.. ئەو چۆڵ ویستیەو خەڵوەكێشانە شتێك بووە، خوای گەورە بەئیلهام خستوویەتییە دڵی پەیامبەرەوە، ئەوەبوو لەپێش پەیامبەرێتیدا دەچووە ئەوجێگایە بۆبیركردنەوە لەدەسەڵاتی خوای گەورەو، چۆنیەتی چاككردنی ئەوگەلە سەرلێشێواوو پیاوكوژو بێ وێڵە، تا ئەوەبوو لەوێ خوای گەورە خەڵاتی پەیامبەرێتی كردو قورئانی بۆ نارد.

### سەرەتای پێغەمبەرێتی موحەممەد ﷺ : بەم ئایەتانە دەستی پێكرد:

﴿بسم الله الرحمن الرحیم * [١] اقرأ باسم ربك الذی خلق﴾ ئەی محەممەد! ﷺ بخوێنە ئەوەی وەحیت بۆدەكرێ بەناوی ئەو پەروەردگارەتەوە، كە هەمووشتێكی دروستكرد. سەرنج بدە! ئەم دینە چەندە ئایینێكی بەرزوو روو لەپێشكەوتن و شارستانیەتە، یەكەم نیگا فەرمان بەخوێندن ئەداو هانی مەردوم بۆ خوێندنەوەدەدا ﴿[٢] خلق الإنسان من علق﴾ خەڵقی نەوەكانی ئادەمی كرد لەخوێنپارەیەك ,جا خوایەكی بەدەسەڵاتی ئاواچۆن ناتوانێ پەیامبەری فێری خوێندن بكاو هەرچی پێ بڵێ پێی لەبەر بكات ﴿[٣] إقرأ وربك الأكرم﴾ بخوێنە، وەپەروەردگاری تۆ لەهەموو كەسێك بەخشندەترەو خاوەن رێزێكی بێ سنوورەو هیچ كەسێكی ناگاتێ؟!

### شەرەف و مەزنیی مرۆڤ بە زانستەوەیە:

﴿[٤] الذی علم بالقلم﴾ ئەوخوایەی كەبەهۆی قەڵەمەوە ئادەمیی فێری زانست و نووسین كرد ﴿[٥] علم الإنسان مالم یعلم﴾ ئادەمیی فێری ئەوشتانە كرد كە نەیدەزانی، واتە: فێری هەرشتێكی كرد كەلە ناومنداڵدانی دایكیدا نەیدەزانی، بەڵام لەگەڵ ئەوهەموو بەخششانەدا،هێشتا هەر یاخی دەبێ.

**سەرنجێك:** ئەم سوورەتە لە (كلا إن الإنسان..)ەوە تاكۆتاییەكەی لەبارەی (ئەبوجەهل)ەوە هاتووە، چونكە كاتێ پێغەمبەر ﷺ هەردەم كە لە پاڵ كەعبەدا نوێژی دەكرد ئەو رێی لێدەگرت!!.

### مرۆڤ هەر كە دارایی دیت سەر بزێوی دەكات:

﴿[٦] كلا﴾ ئاگاداربە! ﴿إن الإنسان لیطغى﴾ بەڕاستیی ئینسان (واتە:ئەبو جەهل) وهای شێوەی یاخی دەبێ وستەم دەكات ﴿[٧] ان رآه استغنى﴾ لەبەر ئەوەی كەخۆی بێ نیازودەوڵەمەند دیبێت. ﴿[٨] إن إلى ربك الرجعى﴾ دە بەراستیئەی پێغەمبەر! گەڕانەوەی هەموان هەر بۆلای پەروەردگارت.

**ئەوانەی رێگە لە نوێژو خوا پەرستیی دەگرن:**

﴿٩ ارايت الذى ينهى * ١٠ عبدا إذا صلى﴾ ئايا ديتت ئەو(طاغيە)ی ڕێگری كرد لەبەندەيەكی خوا (موحەممەدﷺ) كاتێ نوێژ دەكرد بۆخوا، ئای ئەوجۆرە كەسانە چ مرۆڤێكی ياخيی و دڵرەق و بێ ويژدان و بێوێڵن! ﴿١١ ارايت إن كان على الهدى﴾ پێم بڵێ: ئەگەر -ئەو بەندە نوێژخوێنە- لەسەرر ڕێ ڕاست و هەقيش بێت ﴿١٢ او امر بالتقوى﴾ يان فەرمان بەپاريزكاريی وتەقوا بدا، ئايا پياوێكی ئاوا هەقە ڕێی لێبگيرێ و ئەشكەنجە بدرێ و نەهێڵرێ نوێژەكانی بكات؟! ﴿١٣ ارايت إن كذب وتولى﴾ پێم بلێ: ئايا ئەوكابرايە ئەگەر بڕوای بەقورئان نەهێناوپشتی لێ هەڵكرد، ناترسێت لەوە كەخوا قەهری لێبگرێت؟ ﴿١٤ الم يعلم بأن الله يرى﴾ ئايا (ئەبو جەهل) نەيزانيوە كەبەراستی خوا ئەيبينێ و ئاگای لێيەتی؟ جائەگەر ئەو بۆخۆی ئەوهەستەی بووبا ئەوەندە لاسار نەئەبوو﴿١٥ كلا﴾ دەبا ئەوەندە ياخيی و سەركەش نەبێ ﴿لئن لم ينته﴾ سوێند بەخوا ئەگەر لەوكارە بەدانەی خۆی دەست هەڵنەگرێ و كۆڵ نەدات ﴿لنسفعا بالناصية﴾ بەپێشە سەری دەيگرين وبۆدۆزەخی ڕائەكێشين ﴿١٦ ناصية كاذبة خاطئة﴾ پێشە سەرێكی درۆزنی خەتاكار، واتە: ئەوەندە درۆزن و هەڵەكارە لەكارەكانیدا لەناو چاويەوە ديار بووە و، بۆتە سيفەتی هەميشەيی و هەتاهەتايی ﴿١٧ فليدع ناديه﴾ جا بائەوكاتە هاوەڵ و هاوڕێ و هاودانيشتووەكانی بانگ بكاو هاواريان بۆ ببات بەڵكو نەهێڵن، (ئيبن عەباس) دەڵێ: ئەگەر هاواری بۆ بردبان، دەستبەجێ فريشتەی سزا دەيگرت و تيادەچوو. پێشەوا ئەحمەد/٣٢٩ ﴿١٨ سندع الزبانية﴾ بە تەئكيدئێمەش دەرگاوانەكانی دۆزەخی بۆ بانگ ئەكەين تا بيگرن , كە بەڕاستيی كۆمەڵێكی زەبر بەدەستن.

**هەرگيز پەيڕەويی لە پياوی خراپ مەكە:**

﴿١٩ كلا﴾ باكاری وانەكات جارێكیترئەو سەرسەختە لەخوا نەترسە, واتە:با لەو ئيشانەی،دەست هەڵبگرێ پێش دووچار بوونی ﴿لا تطعه﴾ تۆيش ئەی موحەممەد!ﷺ، قەت بەقسەی مەكە ﴿واسجد واقترب﴾ وەبەردەوامبە لەسەر كرنووش و نوێژی خۆت، وە خۆت بەوە نزيك بكەوە لەخوا، چونكە باشترين كات بۆلەخوا نزيكبوونەوە كاتی سوژدەيە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((أقرب مايكون العبد من ربه وهو ساجد، فأكثروا الدعاء)) رواه مسلم:١/٣٥٠.

واتە: نزيكترين كاتی نزيكبوونەوەی بەندە بەپەروەردگاريەوە، ئەو دەمەيە كە نێوچاوان و تەوێڵی لە سوژدەدابێ بۆی، كەوابوو دوعاو لاڵەی زۆر بكەن لەخواوەندی پەروەردگارتان. وە هەركات پێغەمبەر ﷺ سوورەتی (عەلەق)ی دەخوێندەوە سوژدەی(تيلاوەت)ی دەبرد/ موسليم: ١/٤٠٦.

كۆتايی سوورەتی (عەلەق).

لەگەڵ سوپاسی بێپايان بۆ خوای كارزان.

*** *** ***

## ٩٧- سوورەتی ( قەدر )ـە

## مەككەييەو ( ٥ ) ئايەتە

**بەناوی خوای بەخشندەی ميهرەبان**

ئەم سوورەتە لە بارەی دياريكردنی سەرەتای هاتنە خوارەوەی قورئانەوە قسەدەكات، وەلەپلەوگەورەيی ئەو شەوە پيرۆزە دەدوێ كە قورئانی تياهات، خۆ حورمەت وريزی ئەوشەوەش لەتەواوی ڕۆژو مانگەكانی ساڵ زياترە، چونكە قورئانی تيا هاتووە، شياوی باسە لەچوار جێگای قورئاندا باسی هاتنەخوارەوەی قورئانی پيرۆزكراوە.

یەکەم: ئەم سوورەتی (قەدر)ە، ئایەتی: (١-٥).

دووەم: (دوخان): (إنا أنزلناه في ليلة مباركة إنا كنا منذرين)٣.

سێیەم: (بەقەرە): (شهر رمضان الذي أنزل فيه القرآن..).

چوارەم: (ئەنفال): (.. إن كنتم آمنتم بالله وما أنزلنا على عبدنا يوم الفرقان يوم التقى الجمعان..)٤١.هەموو ئەمانەش ئەو راستیە دووپات دەکەنەوە کە قورئان لە شەوی (قەدر)ی مانگی رەمەزاندا هاتووە.

**گەورەیی و مەزنیی شەوی قەدر:**

خـوای گـەورە بـۆ پـتر شـیرینکردنی قورئـان لای موسـڵمانانی جیهـان، بـەم چـەند ئایەتـە کورتانـە پلـەو مەنزیلەیـەکی‌بێ وێنـە دەبەخشـێ بـەو کاتـە ئـەوی تێـدا هـاتووە، جـادەبێ خـۆی چـەندە گـەورەو مـەزن بێـت، بۆیـە دەفەرموێ: ﴿بسم الله الرحمن الرحيم *[١] إنا أنزلناه في ليلة القدر﴾ بەڕاسـتیی ئێمـە لەشـەوێکی زۆر پـیرۆزو بـەڕێزدا قورئانمان دابەزاند.

سُورَةُ القَدْرِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ فِى لَيْلَةِ ٱلْقَدْرِ ﴿١﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا لَيْلَةُ ٱلْقَدْرِ ﴿٢﴾ لَيْلَةُ ٱلْقَدْرِ خَيْرٌ مِّنْ أَلْفِ شَهْرٍ ﴿٣﴾ تَنَزَّلُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِم مِّن كُلِّ أَمْرٍ ﴿٤﴾ سَلَٰمٌ هِىَ حَتَّىٰ مَطْلَعِ ٱلْفَجْرِ ﴿٥﴾

سُورَةُ البَيِّنَةِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

لَمْ يَكُنِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ وَٱلْمُشْرِكِينَ مُنفَكِّينَ حَتَّىٰ تَأْتِيَهُمُ ٱلْبَيِّنَةُ ﴿١﴾ رَسُولٌ مِّنَ ٱللَّهِ يَتْلُوا۟ صُحُفًا مُّطَهَّرَةً ﴿٢﴾ فِيهَا كُتُبٌ قَيِّمَةٌ ﴿٣﴾ وَمَا تَفَرَّقَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَةُ ﴿٤﴾ وَمَآ أُمِرُوٓا۟ إِلَّا لِيَعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلْقَيِّمَةِ ﴿٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ وَٱلْمُشْرِكِينَ فِى نَارِ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمْ شَرُّ ٱلْبَرِيَّةِ ﴿٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمْ خَيْرُ ٱلْبَرِيَّةِ ﴿٧﴾

بـەڵێ بەڕاستیی ئەوشـەوە زۆر بـەڕێزە، چونکە قورئانی تێدا هاتووە، جا دەبێ چ پلەیـەك لـەوە گـەورەتربێ کـەخوای گەورە بەوشـەوەی بەخشیوە؟ ﴿[٢] وما أدراك ما ليلة القدر﴾ تـۆ چـووزانیت شـەوی بەفـەڕ چیە و چـەندە بەبەرەکەتـە؟ ﴿[٣] ليلة القدر خير من ألف شهر﴾ شـەوی قـەدر لەهـەزار مـانگ چـاکترە کـە شـەوی قـەدریان تیـا نەبێ،دیاریکردنی‌ژمارەی هـەزار مـانگ پێدەچـێ لای عەرەبەکان باو بووبێ و وترابـێ: فلانە ئیش لەئیشی هەزار مانگ چاکترە، واتە: لـەوە دەچـێ مەبەسـت دیـارییکردنی لای سـەرووی ژمـارە نـەبێ، چـونکە ئـەو شـەوە نـەك لەهـەزار مـانگ، بـەڵکو بەبۆنـەی هـاتنی ئـەم قورئانەوە لەتەواوی رۆژەکانی تری گێتی چاکترە.

**فریشتەکان شەوی قەدر هەموو کاری جێبەجێ دەکەن:**

بەڵێ..بۆ زیاتر قەدرو حورمەتنان لەو شەوە بەفەڕە،خوای گەورە گش کارو رووداوەکانی ساڵی ئایندەی تێدا بە فریشـتە ئـەنجام دەدا،وەك دەفـەرموێ: ﴿[٤] تنزل الملائكة والروح فيها بإذن ربهم﴾ لەوشـەوەدا فریشـتەکان کـە جوبرەئیلیـان لەگەڵدایـە بەفـەرمانی پـەروەردگاریان دادەبەزنـە خـواری بۆپیـادەکردنی ئەوکارانـەی کـە بۆیـان دیارییکراوەو بەرنامەی بۆ دانراوە لەلایەن خواوە ﴿من كل أمر﴾ لـە بەر هـەر کارێك کەبڕیار دەدرێ لەو ساڵەدا ﴿[٥] سلام هي حتى مطلع الفجر﴾ شـەوێ نـەك هـەر ئەوەنـدە گەورەو خاوەن رێزبێت، بـەڵکو هـەر لەسـەرەتایەوە هـەتا هەڵاتنی شەبەق ، ئاشتیی و سـەلام و دروودو رەحمەتە،وەخوای گـەورە جگـە لەخۆشیی و کامـەرانیی شتێکی تری تێدا نانووسێت لەبەر پیرۆزیی و رێـزی قورئان. بۆیـە پێغەمبـەر ﷺ لەبارەی حورمـەت و پیرۆزییـەوە دەفـەرمووێ: هەرکەسێك شەوی قەدر بەعیبادەت و خواپەرستیی بباتـە سـەر دڵنیابە ئیمان و باوەڕی بتـەوو بەهێزەوەو بەتـەمای

ڕەحمەت و میهرەبانی خوای گەورە بێت، ئەوا خوای گەورەش لەهەموو تاوان و گوناهانی رابوردووی خۆش دەبێت. (بوخاریی و موسلیم). فتح الباری: ٢٩٤/٤. موسلیم: ٥٢٣/١. ئەو شەوە لەدەشەوە کانی ئاخری مانگدایە، وەك لەفەرموودەیەکدا هاتووەو پێشەوا ئەحمەد ریوایەتی دەکا ودەڵێ: ((لیلة القدر فی العشر البواقی..)).

**نیشانەکانی:** شەوێکی پاکژو ساف وخاوێنە، مانگێکی روون و ئاشکرای هەیە، نە ساردە نەگەرم، پزیسکی ئەستێرەی تیا فڕێ نادرێت، خۆرەکەی زۆر بەخاوێنی و جوان هەڵدێ و هەرگیز شەیتانی لەتەك نابێت. پێشەوا ئەحمەد: ٣٢٤/٥.

کۆتایی سوورەتی قەدر

*** *** ***

## ٩٨- سوورەتی (بەيينە)یە

## مەدەنییەو (٨) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتە باس دەکات لە:

یەکەم: هەڵوێستی خاوەننامەکان بەرامبەر پەیامەکەی پەیامبەر ﷺ.

دووەم: یەکلا کردنەوەی ئایینداریی تەنها بۆخوا.

سێ یەم: پاشەرۆژی بەختیاران و بەدبەختان لەپاشەرۆژدا. جا لەسەرەتاوە هەڵوێستی (جوولەکەو گاور)ەکان باس دەکات سەبارەت بە بانگەوازەکەی پەیامبەرﷺ، پاش ئەوە کە راستییان بۆ دەرکەوت، هەر وەك دەست ئەخاتە سەر ئەوانەی پیشەیان هەر تاوان و خراپەکارییە, وەك خاوەن نامە بێ باوەڕەکان و هاوەڵدانەران و مانەوەیان لەدۆزەخدا بەهەتا هەتایی، دەستیش ئەخاتە سەر پاشە رۆژی موسڵمانان, ئەوانەی خێرو چاکە بۆتە پیشەیان، بۆدواییش دیارییکردنی بەهەشت لەگەڵ پەیامبەران وصدیقین و شەهیدەکان و صاڵحاندا بۆیان.

### ئەهلی کتێب بەڵگەی روونیان بۆ هات و لە دین دەرچوون:

﴿بسم الله الرحمن الرحیم * [١] لم یکن الذین کفروا من اهل الکتاب والمشرکین منفکین﴾ بێ باوەڕەکان لەخاوەن نامەو هاوبەش دانەران دەست بەرداریان نەبوون لە کوفریان ﴿حتی تاتیهم البینة﴾ تا بەڵگەو نیشانەی روونیان بۆ هات ﴿[٢] رسول من الله﴾ ئەویش پەیامبەرێکە لەلایەن خواوە ﴿یتلوا صحفا مطهرة﴾ کۆپەڕەیەکی نووسراویپاککراوەیان بەسەردا ئەخوێنێتەوە ﴿[٣] فیها کتب قیمة﴾ لە ناویاندان چەند نووسراوێکی راست، بەڵێ لەپاش هاتنی پەیامبەر ﷺ خاوەن نامە کان وەزعیان گۆڕا، ئەوانەیان سروشتێکی پاکیان بوو بڕوایان هێنا، هەندێکیشیان هەر لەسەر حاڵەتی خۆیان مانەوە، وەك ئەفەرموێ: ﴿[٤] وما تفرق الذین اوتوا الکتاب إلا من بعد ما جائتهم البینة﴾ خاوەننامەکان لە پێغەمبەریێتی(مەحەممەد) جیاوازیان تێنەکەوت و دەستە دەستە نەبوون، دوای ئەوە نەبێ کە بەڵگەی روونیان بۆهات دەربارەی پێغەمبەر، ئیتر ئەوکاتە لەبەر حەسادەت و دڵپیسی خۆیان بوونە دوودەستەوە، هەندێکیان بڕوایان هێنا، هەندێکیشیان وەك خۆیان مانەوە، ئینجا لەسەر بڕوا نەهێنانیان سەر زەنشتیان ئەکا، وەك ئەفەرموێ: ﴿[٥] وما امروا﴾ لە هەمان کاتا لە (تەورات و ئینجیل)دا فرمانیان پێ نەدرابوو ﴿الا لیعبدوا الله مخلصین له الدین﴾ بەوە نەبێ کە بەتەواوی هەموو خواپەرستن و سەر بۆئەو دانەوێنن و ئایینی خالیس هەر بۆئەو دابنێن ﴿حنفاء﴾ ولەهەموو ئایینێکی هیچ وپوچ لابدەن ﴿ویقیموا الصلاة﴾ و بەتێرو تەسەل

نوێژەکانیان بکەن ﴿ويؤتوا الزكاة﴾ لەماڵ و سامانیان زەکات بدەن بەو شێوەیەی بۆیان روون کراوەتەوە ﴿وذلك دين القيمة﴾ وەهەر ئەوخوا پەرستیی و یەکلا بوونەوەیەو نوێژو زەکات دانەیە ئایینی پایەدارو راستە، ئاوا فرمانیان پێکرابوو، کەچی ئەوان جیابوونەوەو بوونە چەند دەستەیەك، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((إن اليهود اختلفوا على احدى وسبعين فرقة، وإن النصارى على ثنتين وسبعين فرقة، وستفترق هذه الأمة على ثلاث وسبعين فرقة، كلها في النار إلا واحدة) قالوا: من هم يا رسول الله؟ قال: ما أنا عليه وأصحابي)) القرطبي:٤/١٦٠،١٥٩.

**لە هەمووکەس خراپتر خاوەن نامە لە دین دەرچووەکانن:**

﴿إن الذين كفروا﴾ بەڕاستی ئەوانەی بێ بڕواو کافربوون ﴿من أهل الكتاب والمشركين﴾ لەخاوەن نامەو بتپەرستەکان ﴿في نار جهنم خالدين فيها﴾ دەخرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوەبەهەتا هەتایی تێیدا قەتیس ئەبن ﴿أولئك هم شر البرية﴾ ئائەوانە خراپترینی دروستکراوەکانن، چونکە پاش دۆزینەوەی ڕێیڕاست لایاندا.

**لە هەموو کەس چاکتر ئیمانداره ئاکار چاکەکانن:**

﴿إن الذين آمنوا﴾ بەڕاستی ئەوانەش وا ئیمان و بڕوایان هێنا ﴿وعملوا الصالحات﴾ و کارە چاکەکانیان ئەنجامدا ﴿أولئك هم خير البرية﴾ ئائەوانە چاکترینی هەموو دروستکراوەکانی سەرزەویین ﴿جزاؤهم عند ربهم﴾ پاداشیان لەلای پەروەردگاریان ﴿جنات عدن﴾ چەند باخاتێکی هەمیشەیی بەهەشتە ﴿تجري من تحتها الأنهار﴾ لەبن درەختەکانیەوە چەندین جۆگەئاوو روبارودەڕوات ﴿خالدين فيها أبدا﴾ و بەئێجگاری تێیدا ئەمێننەوەو ژیان دەبەنە سەر ﴿رضي الله عنهم﴾ خوا لێیان رازیی و خۆشنوودە بە هۆی کارە چاکەکانیانەوە ﴿ورضوا عنه﴾ وئەوانیش لەو رازیی و، خۆشنوودن سەبارەت بەو هەموو بەخششەی پێیداون ﴿ذلك لمن خشي ربه﴾ ئەو ڕێزو پاداشە گەورەیە بۆ هەر کەسێکە کە بە راستی لەپەروەردگاری خۆی ترسابێ و فرمانەکانی جێبەجێ کردبێ.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((باشترینی دروستکراوەکانی سەر زەوییتان پێ بڵێم؟: وتیان: بەڵێ. فەرمووی: پیاوێکە هەمیشە خۆی ئامادە کردووە بۆ غەزاو جیهاد، جڵەوی ئەسپەکەی بەدەستەوەیەتی، هەر شتێك روویدا بەخێرایی خۆی فڕێدەداتە سەری، لەخوارووی ئەویشەوە کەسێکە لەناو مەڕەکانیدا دەژی، نوێژ دەخوێنێ و، زەکات دەدات، خراپترینی گشت خەڵکیش ئەو کەسەیە: بە داوای شتێکیان لێدەکرێ کەچی هێمان نایاندەن)) أحمد:٢/٣٩٦.

کۆتایی تەفسیری سوورەتی (بينة).

## ٩٩- سوورەتی (زەلزەلە)

## مەدەنییەو (٨) ئایەتە

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

ئەم سوورەتە هەرچەند بەشێوازو ئوسلوب لە سوورەتە مەککییەکان دەچێت، چونکە باسی قیامەت و حاڵەتە دژوارەکانی ئەو رۆژە دەکات، وە بەم شێوە یەش دەست پێ ئەکات: ﴿بسم الله الرحمن الرحيم* [1] إذا زلزلت الأرض زلزالها﴾ کاتێ کە زەوی بەتوندی تەکانیداو کەوتە لەرزە لەرزو جووڵەجووڵ، بەهەرهۆیەکەوە بێت، (ئیبن عەباس) ئەڵێ: ئەوە لە (نەفخە)ی یەکەمدایە، بە جۆرە لەرزەیەکی وا کەشایستەی ئەوبێت، جائەبێ ئەوحاڵەتە چ ڕووداوێکی گەورەبێت ﴿وأخرجت الأرض أثقالها﴾ وزەوی هەرچی باری گران وقورسی هەبوو فڕێی دایە دەرەوە: (مردووان، نەوت و، ئاوو، خەزنەو، هەزاران هەزار شتی تر) پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((تقيئ الأرض أفلاذ كبدها أمثال الأسطوان من الذهب والفضة، فيجئ القاتل فيقول: في هذا قَتَلْتُ، ويجئ القاطع فيقول: في هذا قطعت رحمي،

ویجئ السارق فیقول: فی هذا قطعت یدي، ثم یدعونه فلا یأخذون منه شیئا)) مسلم: ١٠١٣. مەبەست ئەوەیە کە هەرچی زێڕو زیوو نەختینە هەیە لەوڕۆژەدا بەفەرمانی خوا هەڵی دەداتە دەرێ، ئیتر خەڵکان دەڵێن: بەهۆی ئەمەوە بوو گوناح و تاوانمان دەکرد!

**قیامەت هات زەمین بوومەلەرزە لێیدەداو، مرۆڤ دەڵێ چی قەوماوە؟:**

﴿[٣] **وقال الإنسان ما لها**﴾ وئەوکاتە ئادەمیی کافر بەسەر سوڕمانێکەوە دەڵێ: زەوی چییەتی وا دەکات..؟ ﴿[٤] **یومئذ تحدث اخبارها**﴾ لەوڕۆژەدا زەوی هەواڵەکانی خۆی چاك و خراپ رادەگەیە نێت و، مەردوم تێ ئەگات کەئەو زەمین لەرزەیە سەرەتای رۆژێکی سەخت و وێران بوونی دونیایە ﴿[٥] **بأن ربك اوحی لها**﴾ ئەویش بەهۆی ئەوەوە کە پەروەردگارت وەحیی و فرمانی پێکردووە بەو زەلزەلەیە، واتە: لەخۆیەوە ناتوانێ هیچ بکات وهەردەم لە ژێر دەستەلاتی خوادایە ﴿[٦] **یومئذ یصدر الناس اشتاتا**﴾ لەوڕۆژەدا خەڵکی بەپەرش وبلاوی لەگۆڕەکانیان دەردەچن بۆشوێنی حیساب ﴿**لیروا اعمالهم**﴾ بۆئەوەی پاداش و تۆڵەی کارو کردەوەکانیان نیشان بدرێت.

**تۆزقاڵەیە (خێرو شەڕ) ون نابێ:**

﴿[٧] **فمن یعمل مثقال ذرة خیراً یره**﴾ ئینجا هەرکەسێك کێشی وردیلەیەك چاکەی ئەنجامدابێت، پاداشەکەی دەبینێتەوە ﴿[٨] **ومن یعمل مثقال ذرة شراً یره**﴾ وکەسێکیش کێشی وردیلەیەك شەرو خراپەی کردبێت، تۆڵەکەی دەبینێتەوە، مەگەر خوا قەڵەمی عەفوو بێنی بەسەریا، کەوابوو باهەموومان هۆشیارو زیرەك و وریابین، بزانین رۆژانە چیئەکەین و لەخوا بترسین. لەگەورەییو فەزیلەتی ئەم سورەتەیە کەئیمامی (تیرمیزی) لە (ئەنەس)ەوە دەگێڕێتەوەکە: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((من یقرأ إذا زلزلت عدلت له بنصف القرآن، ومن قرأ (قل یا أیها الکافرون) عدلت له بربع القرآن، ومن قرأ (قل هو الله أحد) عدلت له بثلث القرآن)) واتە: ئەو کەسەی کە سوورەتی (زەلزەلە) دەخوێنێتەوە، بەلای خواوە پاداشتی نیوەی قورئانی بۆهەیە، ئەوەش کە سوورەتی (قل هوالله أحد) دەخوێنێتەوە، پاداشتی سێیەکی قورئانی بۆهەیە، وەئەوەش کەسوورەتی (قل یاأیها الکافرون) دەخوێنێ، ئەوا پاداشتی چواریەکێکی قورئانی بۆدەنووسرێت.

الجزء الثلاثون — سورة الزلزلة

جَزَآؤُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّٰتُ عَدْنٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ
فِيهَآ أَبَدًا رَّضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَشِىَ رَبَّهُۥ ﴿٨﴾

سُورَةُ الزَّلْزَلَةِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ زِلْزَالَهَا ﴿١﴾ وَأَخْرَجَتِ ٱلْأَرْضُ أَثْقَالَهَا
﴿٢﴾ وَقَالَ ٱلْإِنسَٰنُ مَا لَهَا ﴿٣﴾ يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا ﴿٤﴾
بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَىٰ لَهَا ﴿٥﴾ يَوْمَئِذٍ يَصْدُرُ ٱلنَّاسُ أَشْتَاتًا
لِّيُرَوْا۟ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿٦﴾ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا
يَرَهُۥ ﴿٧﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ ﴿٨﴾

سُورَةُ الْعَادِيَاتِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلْعَٰدِيَٰتِ ضَبْحًا ﴿١﴾ فَٱلْمُورِيَٰتِ قَدْحًا ﴿٢﴾ فَٱلْمُغِيرَٰتِ صُبْحًا
﴿٣﴾ فَأَثَرْنَ بِهِۦ نَقْعًا ﴿٤﴾ فَوَسَطْنَ بِهِۦ جَمْعًا ﴿٥﴾ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ
لِرَبِّهِۦ لَكَنُودٌ ﴿٦﴾ وَإِنَّهُۥ عَلَىٰ ذَٰلِكَ لَشَهِيدٌ ﴿٧﴾ وَإِنَّهُۥ لِحُبِّ
ٱلْخَيْرِ لَشَدِيدٌ ﴿٨﴾ ۞ أَفَلَا يَعْلَمُ إِذَا بُعْثِرَ مَا فِى ٱلْقُبُورِ ﴿٩﴾

٥٩٩

کۆتایی تەفسیری سوورەتی (زەلزەلە).

*** *** ***

## ١٠٠- سوورەی ( عادیات )ـە

## مەککەییەو ( ١١ ) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتە باسی ولاخ و ئەسپی موجاهیدان و سوارچاکانی کاتی خۆی دەکا، کە چۆن شەبەیخونیان دەبردە سەردوژمن، گومان نییە کەئەوەیش نرخ و گرنگی ولاخ و سواریی نیشان دەدات تا ڕۆژی دوایی، وەهەتا دونیادونیا بێ نرخیان کەم نابێتەوە، جاخوا سوێند ئەخوات بەولاخی هاوەڵان کە: مرۆڤ بەرامبەر بە بەهرەکانی خوای خۆی زۆر سپڵەیە، هەروەك ئەو ڕاستییە دەچەسپێنێ کەئادەمیی ماڵی دونیای زۆر خۆش دەوێ، بەشێوەیەك کە گەلێ جار کەسایەتی خۆی لەکیس دەدا بۆی!وە بەم شێوەیەش دەست پێدەکات:

### خوا سوێند بە چارەوێی جەنگ دەخوا کە مرۆڤ پێ نەزانێ:

﴿بسم الله الرحمن الرحيم * ١ والعاديات ضبحا﴾ سوێند بەو ئەسپانەی بەتاوغاردەدەن لە گۆڕەپانی جیهاددا بەپرماندن و بەپەلە تەپ ئەدەنە سەردوژمن ﴿٢ فالموريات قدحا﴾ ئینجا بەو ئەسپانەی کەلەکاتی پڕتاودا ناڵ و بزماری ژێرسمیان بەتوندی لەبەرد دەداو ئاگر هەڵدەستێنێ ﴿٣ فالمغيرات صبحا﴾ ئینجا بەوئەسپانەی کەلەبەرەبەیاندا هەڵمەت ئەبەنە سەر دوژمن ﴿٤ فاثرن به نقعا﴾ بەو زووهەڵمەت بردنەی بەیانیانەیان تەپ وتۆز هەڵدەسێنن بەهەموولایەکدا بلاودەبێتەوە ﴿٥ فوسطن به جمعا﴾ جا بەوزووە خۆیان ئەکوتنە ناوجەرگەی کۆمەڵێ دوژمنەوە ﴿٦ إن الإنسان لربه لكنود﴾ سوێند بەوانە هەموو، بێگومان ئادەمیی سەبارەت بەپەروەردگاری خۆی زۆر سپڵەو ناسوپاسە ﴿٧ وانه على ذلك لشهيد﴾ وە بە ڕاستی ئادەمیی خۆیشی لەسەرئەو ناسوپاسییە ئاگادارەو کاروکردەوەیی و جمو جوڵەکانی بەڵگەن بۆئەوە.

### مرۆڤ لە ماڵی دنیا چکوس و رژدە:

﴿٨ وانه لحب الخير لشديد﴾ وەبێگومان زۆرحەزی لەماڵ وسامانە ﴿٩ افلا يعلم إذا بعثر مافى القبور﴾ جا کەوادەکات،ئایا نازانێ کاتێ لە گۆڕەکان هێنرایە دەرێ و زیندوو کرایەوە ﴿١٠ وحصل مافى الصدور﴾ وەهەرچی لەسینەو دڵەکاندایە هەر هەمووی کۆکرایەوەو خرایەڕوو ﴿١١ إن ربهم بهم يومئذ لخبير﴾ بەڕاستی لەوڕۆژەدا پەروەردگاریان بەهەمووکارو کردارو گوفتاریان ئاگادارە کەواتە: چۆن ئەوێرێ سەرپێچی و تاوان بکات، لەکاتێکا ئەمرێ و زیندوو ئەکرێتەوەو ڕازی دڵی دەرئەخرێ.

کۆتایی تەفسیری سوورەتی (عادیات).

*** *** ***

## ١٠١- سوورەتی ( قاریعە )یە

## مەککەییەو ( ١١ ) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتە باسی پلەکانی ڕۆژی (قیامەت)دەکات، ئەوشتانەی کەلەو ڕۆژەدا ڕوودەدەن: دەرچوونی ئادەمیی لەگۆڕدا، بلاوە کردنیی و، سەرگەردان بوونیی وەك پەپولەی پرش وبلاو، گۆڕینی کێوەکان وەك خوری شیکراوە کەبەبایەکی سووك بلاوبێتەوە.. پاشان دەرەنجامی قورسی و سوکی کرداری خەڵکی و شوێنیان دیاری دەکات و، وە

بەم شێوەیە دەست پێدەکات: ﴿بسم الله الرحمن الرحیم* ١ القارعة ﴾ راچڵەکێنەر ﴿ ٢ ما القارعة ﴾ راچڵەکێنەر چیيە؟ ﴿ ٣ وما ادراك ما القارعة ﴾ تۆ چوزانیت داچڵەکێنەر چییە؟.

**قیامەت هات مرۆڤ وەك پە پوولەی پرژاو دەبن:**

﴿ ٤ یوم یکون الناس کالفراش المبثوث ﴾ ڕۆژێکە گشت مەردوم وەکو پەپوولەی پرش وبلاوی لێدێ ﴿ ٥ وتکون الجبال کالعهن المنفوش ﴾ کێوەکانیش وەك خوری شییکراوەیان لێ دێت و بەهەوادا دەڕۆن.

**پاداش و تۆڵە بە پێی تای تەرازووە:**

﴿ ٦ فاما من ثقلت موازینه ﴾ ئینجا ئەو کەسە کەلەڕۆژەدا تای کێشانەی کردەوەکانی قورس بوو ﴿ ٧ فهو فی عیشة راضیة ﴾ ئەوە لەنێو گوزەران و خۆشییەکی وادا دەبێت، خۆی پێی ڕازییە ﴿ ٨ واما من خفت موازینه ﴾ بەڵام ئەوکەسەش کەتای کێشانەی کردەوەکانی سووك بوو ﴿ ٩ فأمه هاویة ﴾ ئەوە دایکی ئەو دۆزەخەو باوەشی بۆ گرتۆتەوە ﴿ ١٠ وما ادراك ماهیة ﴾ جا تۆ چوزانیت (هاویە)چی‌یە؟ ﴿ ١١ نار حامیة ﴾ ئاگرێکی زۆر گەرمە. ئیمامی (بوخاریی و موسلیم) لە (ئەبو هورەیرە)وە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((نارکم هذه یوقد ابن آدم جزء من سبعین جزءا من حر جهنم)). ئەم ئاگرەی ئێرەیەتانە بەشێکە لەحەفتا بەشی گەرمای ئاگری دۆزەخ. هاوەڵان وتیان بەخوا سوێند ئەوەندە بەسە! ئەویش فەرمووی: ((إنها فضلت علیه بتسعة وستین جزءا، کلهن مثل حرها)) بەڕاستی ئەو ئاگری دۆزەخە (٦٩) بەشی لەم ئاگری ئێرەتانە زیاترە، هەر بەشەیش وەك گەرمای ئەو دەبێت..!! فتح الباری:٣٨٠/٦. مسلیم: ٢٨٤/٤. وە هەروەها دەربارەی قورسیی و نارەحەتی ئەو ئاگرەیە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((اذا اشتدّ الحر فأبردوا عن الصلاة، فإن شدة الحر من فیح جهنم)). فتح الباری: ٢٠/٢. موسلیم: ٤٣٠/١.واتە: هەرکە گەرمای نیوەڕۆ تینی سەند، ئێوەش نوێژ دوابخەن بۆ کاتێ فێنك دەکا، نزیك بەوەختی نوێژی عەسر، هەتا نارەحەت وماندوونەبن چون گڕەی گەرما لەهەناسەی دۆزەخە.




کۆتایی سوورەتی (قاریعە).

لەگەڵ سوپاسێکی زۆردا بۆ خوای گەورە.

*** *** ***

## ١٠٢- سوورەتی (تەکاثور)ـە

## مەککەییەو (٨) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئـەم سوورەتە باسـی سـەرگەرمیی و سـەرقاڵبوونی ئادەمیی دەکـات بـەهۆکانی خۆشویستنی دونیـاوە، وە بـە شانازی کردن بـەماڵ و منـاڵی زۆرەوە، دیـارە ئـەوە هۆیـەکی خراپـە، مـرۆڤ لەخواناسین لائـەدا، هـەر بۆیـەش چـەند جارێك هۆشیارییان ئـەداتێ و ئاگاداریـان ئەکاتـەوە کـەواز لـەوخووە ناپەسـەندو ناجوامێرانە بێنن، دواییش باسی ئەوحاڵەتە سەخت و نارەحەتە دەکات کە لەقیامەتدا رووبەڕوویان دەبێتەوە.

### دنیا ویستی، قیامەت لە بیر دەبا:

﴿بسم الله الرحمن الرحیم * ١ الهاکم التکاثر﴾ خەڵکینـە خۆهەڵکێشانتان بە زۆریی سامان و منـاڵ بێ ئاگای کردوون، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ((یقول العبد: مالی مالی، وإنما له من ماله ثلاث: ما أکل فأفنی، او لبس فأبلی، أو تصدق فأمضی، وما سوی ذلك فذاهب وتارکه للناس)) مسلم: ٢٢٧٣/٤. واتـە: هـەمیشە بەندە دەڵێت: ماڵەکەم، ماڵەکەم، کەچی ماڵی ئەو تەنها سێ جۆرە: ئەوەی خواردوویەتی و تیاچووە، یان ئەوەی لەبەری کردووە و کۆنی کردووەو نەماوە، یان ئەوەی بەخشیویەتی و تێپەڕیوە، ئیتر بێ لەوە هـەموو دەڕواو بەجێی دێڵێ بۆخەڵك ﴿ ٢ حتی زرتم المقابر﴾ تا ئەوکاتـەی ئـەمرن و دەنێژرێن لـە گۆڕستانەکاندا، بیر کردنـەوە لـە (گۆڕ) دڵانـی خـەوتوو وە خەبەر دێنێ، رۆژی ئەولا وەبیردێنێ، دونیا کەم دەنرخێنێ، بۆیە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((کنت نهیتکم من زیارة القبور، فزوروا القبور فإنها تزهد فی الدنیا، وتذکر الآخرة)) ئیبن ماجە. من کاتی خۆی لەسەردانی گۆڕان رێگریم کردن، بەڵام ئێستا بچن بۆ سەردانی گۆڕان، چونکە سەردانی دونیاتان لاکەم نرخ دەکاو، ئەو رۆژەکەشتان وەبیر دێنـێ. ﴿ ٣ کلا سوف تعلمون﴾ وانابێ ئێوە ئەتانەوێ، لەمەولا چاك دەزانن و تێ ئەگەن کە ئێوە بەهەڵەدا چوون و چیتان بەسەردێ ﴿ ٤ ثم کلا سوف تعلمون﴾ دیسان وانابێ ئێوە ئەتانەوێ، لەئایینـدەدا چاك دەزانن و تێ ئەگەن، پاشە رۆژتان چۆن ئەبێ ﴿ ٥ کلا لو تعلمون علم الیقین﴾ نا ئەگەر ئەتان زانی بە زانینـی یەقین، وازتان لـە خۆهەڵکێشان بە زۆری ماڵ و مناڵ دەهێنا.

### دۆزەخ دەبینن و، لە خۆشی دنیا بەرپرسیارن:

﴿ ٦ لترون الجحیم﴾ سوێند بەخوا بەچاوی خۆتان دۆزەخ دەبینن ﴿ ٧ ثم لترونها عین الیقین﴾ دیسانەوە بێ گومان بەچاوی یەقین دۆزەخ ئەبینن ﴿ ٨ ثم لتسئلن یومئذ عن النعیم﴾ پاشان باوەڕتان هەبێت لەو رۆژەدا پرسیاری هـەموو بەهرەیـەکتان لێدەکرێ: تەندروستیی، ماڵ و سامان، خێڵ و هـۆز، هـەر بەهرەیـەکی ترکـە خـوا پێـی دابن، چۆنتان دەست کەتووە..؟ لەڕێی شەرعەوە، یا لەرێگاکانی ترەوە..؟ وە چۆنتان بەخت کرد..؟ پێشەوا (موسلیم) لە (ئەبو هورەیرە)وە دەڵێ: رۆژێ یا شەوێ پێغەمبەر ﷺ لەماڵ دەرچوو، دیتی وا (ئەبوبەکر) و (عومەریش) هاتوونەتە دەرێ! فەرمووی: ((ما أخرجکما من بیتکما هذه الساعة)) چ شتێ ئێوەی لـەم ناوەختـەدا لـەماڵ وەدەرناوە؟! وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا برسێتی، فەرمووی: ((وأنا، والذی نفسی بیده لأخرجنی الذی أخرجکما قدما)) رواه الترمذي. منیش سوێندم بەو زاتەی کە گیانی منی بەدەستە هەر ئەوشتە وەدەری ناوم، کە ئێوەی وەدەرناوە..!

کۆتایی تەفسیری سوورەتی (تەکاثر).

*** *** ***

## ١٠٣- سوورەتی ( عەصر )ـە
## مەککەییەو ( ٣ ) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم کورتە سوورەتە، بەپەلە باسی هۆکانی بەختیاریی و سەرفرازیی ئادەمزاد دەکات، هاوڕێ لەگەڵ هۆکانی سەرکەوتنیی و، بەختەوەرییدا سوێند دەخوات بەوکاتەی کە تەمەنی مرۆڤی تێیدا تەواو دەبێ و، لاپەڕەی ژیانی تێیدا دەپێچرێتەوە، وەبەو هەموو شتانە بەدرێژی رۆژگار تێیدا روودەدەن، کە هەرهەمووی پەندوو ئامۆژگارییە بۆئەوانەی وا بەورد بیردەکەنەوە، سوێند دەخوات بە(عەصر) کەهەموو ئادەمیی لەناو زەرەرو زیاندایە، مەگەر کەسێك ئەم چوار پەسن و سیفەتانەی تێدا بێت: بڕوای کامڵ، ئاکاری باش و چاك، باسکردنی هەق و راستیی بۆیەکتر، بەئارامبوون وخۆ ڕاگرتن. بەڕاستیی ئەم سوورەتە بناغەی ئایین و هەموو سەرکەوتنێکە، بۆیە پێشەوا (شافیعیی) (خوا لێیخۆش بێت) دەڵێ: ئەگەر خوا تەنها ئەم سوورەتەی ناردبا، بۆ بەرنامەی ژیانی ئادەمیزاد بەس دەبوو. ئیمامی (تەبەریی)ش لە (عوبەیدوڵڵای کوڕی حەفس)ـەوە دەڵێ: هەرکە دووکەسی هاوەڵان بەیەکتر گەیشتبان، تا سوورەتی (عەسر)یان بۆ یەکتر نەخوێندبا، لێك جیانەدەبوونەوە. پێشەوا (شافیعیی) دەڵێ: ئەگەر خەڵك بەوردیی لەم سوورەتە تێفکرابان بەدرێژایی رۆژگار بەسیان دەبوو.

### مرۆ ( بێ لەم چوار پەسنە ) گش زیانبارە:

ئەم سوورەتە لەبەر ئەوە کە لە مەککەدا دابەزیوە، زۆر پێ لەسەر ئیمان و پەسنەکانی ئیمان دادەگرێت، بۆیە خوای دلۆڤان دەفەرموێ: ﴿بسم الله الرحمن الرحیم * [1] والعصر﴾ سوێند بەکات و رۆژگار کەچەندە گرنگ و بەنرخە، هەر لەبەر ئەمەیشە خوای گەورە سوێندی پێ دەخوات، چونکە (کات) بۆ مرۆڤە زیرەك و وریاکان مایەی بەختیاریی و سەرفرازییان بووە، هەوڵیان تیاداوە بۆ ئازادیی و، سەربەستیی خۆیان، هیچ پشوویان تیا نەداوە.. بەڵام بۆ گەلانی تەمەڵ و نەزان، بۆتە مایەی ژێر دەستەیی و بەد بەختیان، ئای چۆن چەندان ساڵ دێت و دەڕوات، گەلانی ژێر دەستە هەر دەناڵێنن؟ دەسا بۆراستنابنەوەو، لە عەصر سود وەرگرن، وەك پەیامبەر ﷺ راپەڕیی و، سوودی لێوەر گرت و دەرەنجام گەلەکەی خستە سەر فرازییەوە ﴿[2] إن الإنسان لفی خسر﴾ کەبەڕاستیی هەرچی ئادەمیزاد هەیە بەتایبەت ئەوانەیان کە تەکلیفیان لەسەرە لەزیانێکی گەورەدایە ﴿[3] الا الذین آمنوا﴾ جگە ئەوانەی بڕوایان هێناوە ﴿وعملوا الصالحات﴾ و کارە چاکەکانیان کردووە، واتە: هەرچی خێرو چاکە بۆ دین و وڵاتیان هەوڵی بۆ ئەدەن و ئەیکەن ﴿وتواصوا بالحق﴾ وە وەسیەتیان بۆ یەکتر کردووە بەهەق، کە هەمیشە پابەندی هەق بن و ماخولانی

الجزء الثلاثون — سورة العصر

سُورَةُ العَصۡرِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلۡعَصۡرِ ١ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَفِي خُسۡرٍ ٢ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡحَقِّ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ ٣

سُورَةُ الهُمَزَةِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَيۡلٞ لِّكُلِّ هُمَزَةٖ لُّمَزَةٍ ١ ٱلَّذِي جَمَعَ مَالٗا وَعَدَّدَهُۥ ٢ يَحۡسَبُ أَنَّ مَالَهُۥٓ أَخۡلَدَهُۥ ٣ كَلَّاۖ لَيُنۢبَذَنَّ فِي ٱلۡحُطَمَةِ ٤ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡحُطَمَةُ ٥ نَارُ ٱللَّهِ ٱلۡمُوقَدَةُ ٦ ٱلَّتِي تَطَّلِعُ عَلَى ٱلۡأَفۡـِٔدَةِ ٧ إِنَّهَا عَلَيۡهِم مُّؤۡصَدَةٞ ٨ فِي عَمَدٖ مُّمَدَّدَةِۭ ٩

سُورَةُ الفِيلِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

أَلَمۡ تَرَ كَيۡفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصۡحَٰبِ ٱلۡفِيلِ ١ أَلَمۡ يَجۡعَلۡ كَيۡدَهُمۡ فِي تَضۡلِيلٖ ٢ وَأَرۡسَلَ عَلَيۡهِمۡ طَيۡرًا أَبَابِيلَ ٣ تَرۡمِيهِم بِحِجَارَةٖ مِّن سِجِّيلٖ ٤ فَجَعَلَهُمۡ كَعَصۡفٖ مَّأۡكُولِۭ ٥

٦٠١

راستی بن ﴿وتواصوا بالصبر﴾ وه وەسیەتیان بۆیەکتر کردووه بەصەبرو خۆڕاگریی لەسەر هەق و ئایینی خوا، واته: مرۆڤی موسڵمان دەبێ هیچ کات ماندوو نەبێ و، نەپسێ بەرامبەر بە ئەرکەکانی سەرشانی.

کۆتایی تەفسیری سوورەتی (عەسر).

*** *** ***

## ١٠٤- سوورەتی ( هومەزە )یە

## مەککەییەو ( ٩ ) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتە باسی ئەوکەسانە دەکات کە هەردەم ناوی خەڵك بەخراپە دەبەن و، توانج و تەشەریان لێدەدەن و، هەوڵ دەدەن خراپیان بکەن و گاڵتەو گەپیان پێدەکەن، هەروەك هێرش دەکاتە سەر ئەوانەی ماڵ و سامان کۆ ئەکەنەوەو خەریکی ژماردنیین و، وا ئەزانن کەماڵەکەیان هەرگیز ناهێڵێ بمرن..! کۆتاییشی بە باسێکی کورتی پاشە ڕۆژو جێگای بەدبەختەکان دێت، کە بەئێجگاری دەڕۆنە ناو دۆزەخەوەو ئاگرێکی تێکشکێنەر هرۆژم دەباتە سەردڵیان.

### هاوار بۆ مرۆی تەشەردەر و حوسپکەرو فرەکەری ماڵی دنیا:

خەڵکانێ هەبوون بێ حیساب و ئەژمار لەرێی ناهەقەوە ماڵ و سامانیان کۆ دەکردەوەو، ئەم و ئەویان بەکەم سەیر دەکردو، توانج و تەشەرپیشەیان بوو، جابۆ ترساندن و سەر زەنشتی ئەوانە خوا فورمووی: ﴿بسم الله الرحمن الرحیم * [١] ویل لكل همزة لمزة﴾ سزای سەخت بۆ هەموو توانج گرێکی عەیبگر، واتە: ئەوکەسە ناوی خەڵك بەخراپە دەباو بەشوێن کەم وکوڕیی و نەنگدا دەگەرێ ﴿[٢] الذی جمع مالاً و عدده﴾ ئەو کەسەی کە ماڵێکی زۆری کۆ کردەوەو هەرخەریکی ژماردنی بوو، ئیتر بێ لێکدانەوەی حەڵاڵ و حەرام. واتە: ئەوانە کە ناوی مەردوم دەبەن ئەو دەوڵەمەندانەن بەهۆی سامانەکانیانەوە خۆبەگەورە دەگرن و بەسووك سەیری خەڵکی دەکەن ﴿[٣] یحسب أن ماله أخلده﴾ وا خەریکە بەدنیاوە پێی وایە کەماڵ و سامانەکەی بەئێجگاری لەدنیادا دەیهێڵێتەوە وهەرگیز نامرێ، بۆیە رەفتاری وادەکات ﴿[٤] كلا﴾ با وانەزانێت ﴿لینبذن فی الحطمة﴾ سوێند بەخوا بەسووکیی و ریسوایی فرێ دەدرێتە ناو تێکشکێنەرە (حوتەمە)وە ﴿[٥] وما أدراك ما الحطمة﴾ جا تۆ چوزانیت ئەو تێشکینەرەیە چیە،ئەگەر خوا بۆت باس نەکات ﴿[٦] نار الله الموقدة﴾ ئاگرێکی هەڵکراوی بڵێسەداری خوایە، واتە: بەفەرمانی ئەوەو فریشتەی ئەوی لەسەرە ﴿[٧] التی تطلع علی الأفئدة﴾ ئەو ئاگرێکی وایە رووەدەکاتە بنۆکەی دڵەکان و، پەرەی دڵەکان دەسووتێنێ کە سەرچاوەی کوفر بوون ﴿[٨] إنها علیهم مؤصدة﴾ بەڕاستی ئەو (ئاگرە) دەورەی داون و لەسەریان داخراوەو داپۆشیون، نە هەوای تێدەچێ و، نە هەوای لێدەڕواتە دەرەوە ﴿[٩] فی عمد ممددة﴾ ئەوان بەسراونەوە لەناو چەند کۆڵەکەیەکی درێژکراوەدا. واتە: دژبانیی و کۆنترۆڵیان لێبەستراوەو بەهیچ شێوەیەك رێگای دەرچوونیان نیە و هەرگیز قوتار نابن.

کۆتایی تەفسیری سوورەتی (هومەزە).

*** *** ***

## ١٠٥- سوورەتی (فیل)ە

## مەککەییەو (٥) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتە باسی داستانی خاوەن فیلەکان (أصحاب الفیل) دەکات، ئەو کاتە کە هاتن بۆ وێرانکردنی (کعبة الله)، بەڵام خوای گەورە دای بە پۆزەیانداو، پاشەوپاش سەری خەجاڵەتی پێداخستن و، بەلاوازترین لەشکری خوێ (واتە: بە کۆمەڵێ باڵندە) تەفرو تونای کردن و،ماڵەکەی خۆی پاراست, کە بەراستیی ئەمەیش تا دونیا دونیا بێت بە چیرۆک وداستان باس دەکرێت،

### سەرگوزشتەی فیل سوارەکان:

﴿بسم الله الرحمن الرحیم * [١] الم تر کیف فعل ربك بأصحاب الفیل﴾ ئایا ئەو دەنگ و باسەت پێنەگەیی و، نەتدی کە خوای پەروەردگاری تۆ بەخاوەن فیلەکان چی کرد.؟ ئەوانەی هاتن بۆ وێرانکردنی کابەی شەریف. ﴿[٢] الم یجعل کیدهم فی تضلیل﴾ ئەرێ مەگەر سەری لێ نەشێواندن و فرت و فێڵەکەیانی پوچەڵ نەکردەوە..؟! ﴿[٣] وارسل علیهم طیرا ابابیل﴾ کۆمەڵێکی زۆرو پۆل پۆل باڵندەی نەنارده سەریان؟ ﴿[٤] ترمیهم بحجارة من سجیل﴾ تابە بەردی گڵمتی ڕەق بەردە بارانیان بکەن ﴿[٥] فجعلهم کعصف مأکول﴾ دەرەنجام وەك کای خوراوی لێکردن و ڕیزە بەرێزەبوون و چوونە زبڵگای مێژووەوەو بوونە وانەو چیرۆك بۆهەرکەسێك بیەوێ شەرە شۆخ لەگەڵ ئیسلامدا بکا، کە دەرەنجام هەر سەری خۆیشی پان ئەبێتەوە، وەك سوپاکەی (ئەبرەهە).

**تێبینی:** پێغەمبەر ﷺ هەر لەوساڵەدا (عام الفیل) لەدایکبوو، وەك خۆی ئەفەرموێ: ((وُلِدْتُ عامَ الفیلِ)) رواه الإمام أحمد" شیاوی باسە ئەو رووداوە لەمانگی (موحەرەم)دا پێش لەدایکبوونی پێغەمبەر ﷺ بە پەنجا ساڵ و پێنج رۆژێ، بەرامبەر بە مارسی(٥٧١)زایینی ڕوویدا، هۆی ڕوودانی ئەو ڕووداوەش -وەك ئیبن هیشام ئەڵێ- ئەبرەهەی جێگری گشتیی (نەجاشیی) کە لەوڵاتی (یەمەن)، دیتی عەرەبەکان ئابەو جۆرە دەڕۆنە (کەعبە)، ئەویش لە (سەنعا)دا کەنیشتەیەکی گەورەی کردەوە، بەو مەبەستە کەعەرەبان لەوێوە وەرگێڕێتەوە بۆلای کەنیشتەکەی خۆی، ئەوجا پیاوێك ئەوەی بیست و لەڕقان چوو و (...) تێکرد، ئەویش (ئەبرەهە) بۆ تۆڵە کردنەوە سوپایەکی (٦٠) هەزار کەسی رێکخست بۆ روخاندنی (کەعبە)! کەنزیکەی (٩-١٣) فیل سواریی تێدابوو، سەرەڕای فیلە گەورەکەی خۆی، جا کاتێ گەیشتە دۆڵی (مەحسەر/ نێوان (موزدەلیفە) و(مونا) فیلەکەی خۆی چۆکی داداو هەرچەندە هەوڵیدا نەڕۆیشت..!! جا لەو نێوانەدا خوای کارجوان ئەو پەلەوەرانەی نارده سەریان و تەفروتونای کردن. ئەمە کورتەیەکی ئەو رووداوە بوو.(عەبدولموتتەلیب)یش پاش ئەوەی کەداواکەیان ڕەتکردەوە بۆ ئازادکردنی شترەکانی، دەستی بەئەڵقەکەی کەعبەوە گرت و گوتی:

یارب لا أرجو لهم سواكا     یارب فامنع حماكا

إن عدو البیت من عاداكا     إنهم لن یقهروا قواكا

لاهُمَّ إن العبد یَمْـ     نَعُ رَحْلَهُ فامْنَعْ حِلالَكْ

لا یغلبنّ صلیبُهُم     ومِحالُهُمْ غَدْواً مِحالَكَ

إن یدخلوا البلد الحرا     م فأمر مابدالك

کۆتایی تەفسیری سوورەتی (فیل)

## ١٠٦- سوورەتی (قورەیش )ـه
## مەككەییەو (٤) ئایەتە

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

ئەم سوورەتە هەندێ لە نیعمەت و بەهرەكانی خوا یادی قورەیش ئەخاتەوە، ئەوەبوو زۆر بەئاسوودەیی و، بێ ترس لەهیچ كەسێك، هاتوچۆی زستانە وهاوینەیان دەكرد بۆ بازرگانی، هات و چۆی (یەمەن) و(شام) یان دەكرد لەوپەڕی خۆشیی و، ئارامییدا، وە هیچ كەسێك نەبوو دەست بێنێتە ڕێگەیان.

**قورەیش هەقە خاوەنی كابە بپەرستن:**

الجزء الثلاثون — سورة قريش

سُورَةُ قُرَيْشٍ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

لِإِيلَٰفِ قُرَيْشٍ ﴿١﴾ إِۦلَٰفِهِمْ رِحْلَةَ ٱلشِّتَآءِ وَٱلصَّيْفِ ﴿٢﴾ فَلْيَعْبُدُوا۟ رَبَّ هَٰذَا ٱلْبَيْتِ ﴿٣﴾ ٱلَّذِىٓ أَطْعَمَهُم مِّن جُوعٍ وَءَامَنَهُم مِّنْ خَوْفٍۭ ﴿٤﴾

سُورَةُ المَاعُونِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

أَرَءَيْتَ ٱلَّذِى يُكَذِّبُ بِٱلدِّينِ ﴿١﴾ فَذَٰلِكَ ٱلَّذِى يَدُعُّ ٱلْيَتِيمَ ﴿٢﴾ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ ﴿٣﴾ فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ﴿٤﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ﴿٥﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ يُرَآءُونَ ﴿٦﴾ وَيَمْنَعُونَ ٱلْمَاعُونَ ﴿٧﴾

سُورَةُ الكَوْثَرِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِنَّآ أَعْطَيْنَٰكَ ٱلْكَوْثَرَ ﴿١﴾ فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنْحَرْ ﴿٢﴾ إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ ٱلْأَبْتَرُ ﴿٣﴾

سورة الكافرون — ٦٠٢

﴿بسم الله الرحمن الرحيم* [١] لإيلاف قريش﴾ لەبەر هۆگریی و یەككرتنی قورەیش ﴿[٢] إيلافهم رحلة الشتاء والصيف﴾ هۆگریان بەهاتوو چۆی زستانەو هاوینەوە (زستان بۆ یەمەن، هاوینیش بۆ شام) ﴿[٣] فليعبدوا رب هذا البيت﴾ جا لەبەر ئەوبەهرە گەورەیەی خوایە بەسەریانەوە دەبا هەرخاوەنی ئەم خانەیە (كعبة الله) بپەرستن و هەموو هەر بۆئەو سەردانوێنن" چونكە لەژێر سێبەری ئەمن و ئاسایشی كابەدا ئەوان ئەو هات و چۆیە ئەنجام دەدەن، وەك دەفەرموێ: ((إنما أمرت أن اعبد رب هذه البلدة الذى حرمها وله كل شئ وأمرت أن أكون من المسلمين))٩١/٢٧. ﴿[٤] الذى اطعمهم من جوع وآمنهم من خوف﴾ ئەوخوایەی بەو هۆیەوە قوتاری كردن لە برسێتی و هێوریشی كردنەوە لەترس، واتە:ترسیان لەهیچ دزودرۆزنێك نەما بێتە ڕێگەیان و ڕێیان پێ بگرێ، ئەویش بەهۆی حورمەت و ڕێزی كابەوە بوو، كە لەباوو باپیرانیانەوە بۆیان مابووەوە ڕێزنان لە كابە، جا ئایا لەبەرامبەر هەر بەهرەیەكی خواییەوە سوپاسێك پێویست ناكات..؟ ئای ئادەمیی چەند سپڵەیت..؟!

كۆتایی سوورەتی (قورەیش).

*** *** ***

## ١٠٧- سوورەتی (ماعون )ـه
## مەككەییەو (٧) ئایەتە

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

ئەم سوورەتە بەكورتیی باس لە دوو دەستەو تاقم دەكات:

یەكەم: بێباوەڕێكی دڵڕەقی سپڵەو نكووڵیكەری ڕۆژی دوایی و بەرێ.

دووەم: دوو ڕوویەكی ڕیابازو ڕووپامایيكەر لەكاروكردەوەكانیا.

یەکەمیان: بەپیشە سووکایەتی بەهەتیوان دەکەن و پیایاندا هەڵ دەشاخێن و، پێی بڵێیت چاکە ناکەن و هەوڵیشی بۆ نادەن، وەك (عاصی کوڕی وائیل)و هەرکەسێکیتر وەك ئەو. دووەمیان: ئەودووڕازییانن کە نوێژەکانیان تەنها بۆ روو پامایی دەکەن، بۆیە زۆر بەسووك گرتوویانەو زۆرکەم ڕێك بکەوێت کە لەکاتی خۆیدا بیانکەن، وەیان لەکاتی کردنەکەیدا بێدارو هۆشیار بن، جا خوای گەورە لەهەر دوولایان هەڕەشە دەکات.

**ئەو مرۆڤە رۆژی جەزای لا درۆیە!:**

﴿بسم الله الرحمن الرحیم * [1] أرأیت الذی یکذب بالدین﴾ ئاخۆ دیتت ئەوکەسەی کەچۆن رۆژی جەزا بەدرۆ دەخاتەوە،ئەزانی ئەو کەسە کێیەو صیفەتەکانی چیین..؟﴿[2] فذلك الذی یدع الیتیم﴾ جا ئەوکەسە بێ بڕوایەکی وایە زۆر بەتوندی پاڵ بەهەتیوەوە دەنێ و پیا هەڵدەشاخێ، لەباتی ئەوەدڵ نەوایی بکات ﴿[3] ولا یحض علی طعام المسکین﴾ هەر وەك خۆیشی ئاوایە، دنەوهانی کەسیش نادات لەسەر بەخشین و خواردەمەنی دان بەهەژاران و بێ نەواو نەداران ﴿[4] فویل للمصلین﴾ ئینجا سزای سەخت بۆ نوێژ خوێنەکان ﴿[5] الذین هم عن صلاتهم ساهون﴾ ئەوانەی لەنوێژەکانیاندا غافڵ و بێئاگان،واتە: بەدڵ نوێژەکانیان ناکەن و لەماناو مەبەستەکەی بیر ناکەنەوە، لەپێش چاوخەڵکەوە دەیکەن بەڵام ئەرهەرخۆیانبن نایکەن، ناشزانن فەلسەفەی نوێژکردن چیە ﴿[6] الذین هم یراءون﴾ ئەوانەی لە نوێژەکانیاندا رووپامایی‌دەکەن، واتە:لەبەر ئەوە نوێژ دەکەن پێیان بڵێن نوێژ خوێنن! ئەڵبەت مەبەستێکی تریشیان هەیە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((تلك صلاةُ المنافق، تلك صلاةُالمنافق، تلك صلاةُ المنافق، یَجْلسُ یَرْقُبُ الشمس، حتی إذا کان بین قرْنَیِ الشیطان قام فنَقَرَ أربعاً، لایذکرُ اللهَ فیها إلا قلیلا)) فتح الباری: ٣٨٦/٦. موسلیم:٤٣٤/١. واتە: ئەوە نوێژی مونافیقە, ئەوە نوێژی مونافقە, ئەوە نوێژی مونافقە!دەبینی هەمیشە کاڵ وکرچە ولەجێی خۆیدا نایکا، و زۆر بەقورس و نارەحەتیی و ناچاریی ئەنجامی دەدات، دادەنیشێ و، چاوەنۆڕی خۆر دەکات، جاکە دیتی ئەوا لە نێوان دووشاخەکانی شەیتانەوە خۆردەرکەوت، هەڵدەسێ چوار دەنوك لەزەمین دەدات، زۆر بەکەمیش ئاگای لە خوایە!. ﴿[7] ویمنعون الماعون﴾ وە هەموو جۆرە یارمەتییەکیش لە خەڵکی دەگرنەوەو کۆتایی و دریغی دەکەن. بەڵێ.. مرۆڤ وا دروستکراوە کە بەتەنها خۆی ناتوانێ پێداویستییەکانی ژیانی خۆی جێبەجێ بکات، بۆیە پێویستیی بەدراوسێ و ئەم و ئەوهەیە، ئەویش دەبێ داوای هەرچی لێکرد بە خواستن، بیداتێ و، دەستی لێ نەقوچێنێ، لە دەرزییەکەوە، هەتا پەرداخێك، تەورێك، پاچێك...هتد. مرۆڤی نوێژ خوێنی راستەقینە ئاوایە، بەڵام مرۆی دووڕوو، ریبابازو دەست قووچاوو بێ خزمەتە.

کۆتایی تەفسیری سوورەتی (ماعوون).

*** *** ***

**١٠٨- سوورەتی (کەوسەر)ە**

**مەککەییەو (٣) ئایەتە**

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

ئەم سوورەتە باسی بەهرە گرنگەکانی خوا دەکات بۆپەیامبەر ﷺ، بەتایبەتی ئەوبەهرە گەورەیە کەلەدنیاو لەقیامەتدا پێیبەخشیوە، ئەی دەبێ چ بەهرەیەك لەوە گەورەتر بێت کە هەتاهەتایە ناووشۆرەت و ئایینەکەی هەردەمێنێ و ناکوژێتەوە..؟ ئەوان کە بەپێغەمبەریان دەگوت بێ کوڕو وەجاخ کوێرەو زوو ناوی دەکوژێتەوە، خۆیان بنەبڕ بوون و ناویان چوویە مەزبەلەی مێژووەوە، خۆیان ودین وڕێبازیان پێچرایەوەو کۆتایی هات،

بێگومانیشم هەرکەسێکی تر، بیروبۆچوونی وەك (ئەبوجەهل) و شوێنکەوتوانی ئەوبێ، وەك ئەوی لێدێ و، سەری خۆی پان ئەبێتەوە. لەفەزڵ و گەورەیی سوورەتی (کەوسەر)دا (ئەنەس) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەمزگەوتدا لەنێوانماندا بوو، کتوپڕ کەمێ خەوی لێکەوت، پاشان بەڕوویەکی خۆش وگەش و لێو بەزەردەخەنەوە سەری بەرزەوەکرد، جا ئێمەش وتمان: هۆی ئەو زەردەخەنەیەت چیبوو ئەی پێغەمبەر؟! فەرمووی: هەر ئێستا ئەم سوورەتەم بۆهات و خوێندیەوەو فەرمووی: (بسم الله الرحمن الرحيم.إنا أعطيناك الكوثر. فصل لربك وانحر. إن شانئك هوالأبتر) پاشان فەرمووی: دەزانن (کەوسەر) چیە؟ کەوسەر: چۆم و تاڤگەو و رووبارێکە لەبەهەشتدا، بەرەکەتێکی ئێجگار زۆری هەیە، حەوزو گوڵاوێکە پەروەردگا رم بەڵێنی پێداوم، کە لەقیامەتدا ئوممەتەکەم بێنە سەری، وە بەئەندازەی ئەستێرەکانی ئاسمان لێوان و پەرداخ و سووراحی تێدایە، هەندێ کەس لێی بێبەش دەبێ، منیش دەڵێم: ئەی پەروەردگاری من! خۆ ئەوانە لەئوممەتی منن، خوا ئەفەرموێ: تۆ نازانی پاش تۆ ئەوانە چیان کرد؟! موسلیم:١/٣٠٠, ئەبوداود:١١٠/٥, نەسایی:٥٣٣/٦.

**خوا گش خێرو بێرێکی ئەملاو ئەولای بە پێغەمبەر دا:**

دوا بەدوای ئەوقسە ناخۆش و نالەبارانەی قورەیشە، خوای گەورە بۆ دڵدانەوەی پێغەمبەر، ئەم سوورەتەکورتەیە بۆ دابەزاندو فەرمووی: ﴿بسم الله الرحمن الرحيم * ١ إنا أعطيناك الكوثر﴾ بەڕاستیی ئێمە چاکەو خۆشی و خێرێکی زۆر گەورەمان بەتۆ بەخشی کەمایەی سەر بەرزیی دنیاو قیامەتتە، یەکێ لەوانە رووبارێکی تایبەتە لەبەهەشتدا، وەك ئیمامی (بوخاریی) دەڵێ ﴿٢ فصل لربك﴾ جا نوێژ بکە بۆپەروەردگارت ﴿وانحر﴾ وەلە سوپاسی ئەو هەموو چاکەدا، هەر بۆئەو قوربانی سەر بکە،واتە: وەك قورەیش مەبە، کە حەیوانیان هەم بۆخواو، هەم بۆ بتەکان سەر ئەبڕی، نەخێر،دەشێ تۆتەنها بۆ خوای گەورە قوربانی بکەیت. وەك لەجێگایەکی تردا دەفەرموێ: (قل إن صلاتي ونسكي ومحياي ومماتي لله رب العالمين لاشريك له وبذلك أمرت وأنا أول المسلمين) ١٦١/٦-١٦٢. ئیبن عەباس دەڵێ: (وانحر) بەواتای قوربانی کردنە، هەندێکیش دەڵێن: مەبەست ئەوەیە کە لەکاتی نوێژدا دەستی ڕاستت لەبان دەستی چەپت دابنێی لەژێر گەردنا. ئیمامی (تەبەریی)و(ئیبن کەسیر) دەڵێن: قسەی ئەوکەسە ڕاستە کەوتوویەتی مەبەست قوربانی کردنە، چونکە پێغەمبەر ﷺ نوێژی جەژنی دەکردو، پاشان قوربانیەکەی خۆی سەر دەبڕیی و دەیفەرموو: ((مَنْ صَلَّى صلاتَنا، ونَسكَ نُسُكَنا فقد أصاب النُسُكَ، ومَنْ نَسَكَ قبل الصلاة فلا نُسُكَ له)) متفق عليه.

**ناحەزانی دین وەجاخ کوێرن:**

﴿٣ إن شانئك هوالأبتر﴾ بەڕاستیی هەر دژو ناحەزەکەت (عاسی کوڕی وائیل) کە بەتۆی دەگوت: وەجاق کوێرە دوابڕاوو بێ ناوو نیشانەو لەهەموو خێرێك بێ بەشە، نەك تۆ.

کۆتایی تەفسیری سوورەتی (کەوسەر).

***　***　***

## ١٠٩- سوورەتی (کافیرون)ـە

## مەککەییەو (٦) ئایەتە

### بەناوی خوای دەهندەو دلۆڤان

سوورەت (کافیرون) باسی یەکخواپەرستیی و یەکلابوونەوەو یەخەهەڵتەکاندن، لەگش کوفرو (شیرک)ێك دەکات، بێ بڕوایان "ئەوەندە نەزان و کەم ئاوەز بوون" لە پەیامبەریان ﷺ داوا کرد کە ئەو ساڵێك خواکانی ئەمان بپەرستێ و، ئەوانیش ساڵێك خواکەی ئەم! ئینجا بۆ ڕەتی ئەوانەو دەمکوتیان ئەم سوورەتە زۆر گرنگە هاتە خوارەوەو، بە هەموو شێوەیەك لەوە بێ هیواو مەیووسی کردن و، لەمپەرو بەر بەستێکی لەنێوان هەردولادا دانا و، پێی گوتن: کە هیچ کاتێك نەئێستا، نە ئایندە بەتەمای شتی وا مەبن.

### بەرائەت لە شیرك:

﴿بسم الله الرحمن الرحیم * ١ قل یا أیها الکافرون﴾ ئەی موحەممەد! ﷺ بڵێ: ئەی هۆزی کافرو بێباوەڕان! دارو بەرد پەرستان! خوا نەناسان! ﴿٢ لا اعبد ما تعبدون﴾ ئەوەی ئێوە دەیپەرستن من نایپەرستم، من چی لەدارو بەرد بکەم؟ ﴿٣ ولا انتم عابدون ما اعبد﴾ وە ئەوەش من ئەیپەرستم ئێوە نایپەرستن، چونکە من خوایەکی هەق وراست ئەپەرستم، ئێوەیش دارو بەردو ئەندێشە، دیارە ئەم دوانەش فەرق و جیاوازییان زۆر زۆرە. ﴿٤ ولا انا عابد ما عبدتم﴾ وە منیش پەرەسندەی ئەوە نیم کە ئێوە پەرستووتانە و دەیپەرستن ﴿٥ ولا انتم عابدون ما اعبد﴾ ئێوەیش پەرەسندەی ئەو زاتە نین کەمن ئەیپەرستم.

**بەکورتیی:** لە هیچ کاتێکدا ئێوە بەتەمای ئەوە مەبن کە من بت و خواکانتان بپەرستم، ئەگەرچی ئێوەش حەقتانە خواکەی من بپەرستن، چونکە خواکەی من هەقە و ڕاستە، بەڵام خواکانی ئێوە ناهەقەو ناراست ﴿٦ لکم دینکم ولی دین﴾ جاکەوابوو دین و ئایینی خۆتان بۆ خۆتان و، منیش دین و ئایینی خۆم بۆ خۆم. بەڵێ دەبێ هەمووکات موشریکان و بێ بڕوایان لەوە نائومێد و بێ هیوا بکرێن کە تەنها بۆ ساتێکیش بێت، موسڵمانان خواکانی ئەوان ناپەرستن، وە دەبێ هەمیشە بەربەستێکی پۆڵایین لەنێوان پەرچەمی (لا إله إلا الله)و، پەرچەمی کوفرو بێبڕواییدا هەبێت، کە ئیتر بەهیچ شێوەیەك کاروباری ئوسرەی (لا إله إلا الله) تێکەڵی بڕیارو عادەت و باوو خووی ئەو نەبێت.

هەندێ دەڵێن: ئەم ئایەتە بەئایەتی (سەیف/ فاقتلوا المشرکین کافة) نەسخ بۆتەوە، هەندێ دیکەش ئەڵێن: سوورەتەکە هەموی نەسخە، تاقمێ تر ئەڵێن: هیچ بەشێکی لێ هەڵنەوەشاوەتەوە، لەوە ئەچێ ئەمەیان ڕاست بێت. خوای گەورە خۆیشی باشتر دەزانێت. لەگەورەیی و مەزنیی ئەم سوورەتەدا هاتووە کە (ئەبوداود) ئەڵێ: پیاوێ وتی ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ ئامۆژگارییەکم بکە، ئەویش فەرمووی: ((إقرأ عند منامك (قل یا أیها الکافرون) فإنها براءة من الشرك)).واتە: لەکاتی خەودا سوورەتی: (کافیرون) بخوێنە، چونکە بەرائەت و ئینکاریی و ململانێیە لەگەڵ هەموو جۆرە شیرکێك. (ئیبن عەباس)یش ئەڵێ: لەقورئاندا لەم سوورەتە سەختتر نیە بۆ شەیتان و شوێنکەوتووەکانی، چونکە دووپات کردنەوەو چەسپاندنی بناغەی (تەوحید)ـە، لەولاشەوە (بەرائەت) و بێزارییە لەهەموو جۆرە شیرك و کوفرێك. پێغەمبەر ﷺ لەدوو ڕکاتی نوێژی (تەواف)ی ماڵی خوادا، ئەم سوورەتەو، سوورەتی (قل هوالله احد)ی دەخوێند. موسلیم: ٨٨٨/٢. هەروەك لەدوو ڕکاتەکەی پێش نوێژی بەیانیشدا دەیخوێند. موسلیم:٥٠١/١.

کۆتایی سوورەتی (کافیرون).

## ١١٠- سوورەتی ( نەصر )ـە

## مەدەنییەو ( ٣ ) ئایەتە

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

ئەم سوورەتە باسی ئازادکردنی شاری (مەککە) لە بت و بتپەرستیی دەکا، کە بەڕاستیی موسڵمانان بەو ئازادکردنەیە سەریان گەیشتە لووتکەی سەربڵندیی و، هەربەوەش لەدوای ئەوە لەنیوەدوورگەی عەرەبییدا ئیسلام زۆر بەپەلە پەخشبوو، بۆدواجاریش شیرك و بێ بڕوایی، نینۆکی کراو بێ دەست و پێ کەوت، ئینجا خەڵکی لەهەموو لایەکەوە پۆلپۆل موسڵمان بوون و پەرچەمی (لا إله إلا الله) سەد ئەوەندەی‌تر بەرز بوویەوە. (ئیبن عەباس) -وەك ئیمامی (موسلیم) هێناویەتی- ئەڵێ: ئەمە تەنها سوورەتێکە کە هەمووی پێکەوە بەجارێ هاتبێ. وە لە بەر گەورەیی و مەزنیی فەزیلەتی بەچواریەکی قورئان دانراوە، هەروەك بە ئاخر سوورەتی قورئانی پیرۆزی دادەنێت. نەسایی ٦/٥٢٥ ریوایەتی دەکات. هەروەك بەهێمای کۆچی دوایی پێغەمبەریشی دانا ﷺ، وەکو ئیمامی بوخاریی لە / فتح الباری: ٨/٦٠٦ هێناویەتی.

الجزء الثلاثون — سورة الكافرون

سُورَةُ الكَافِرُونَ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ ١ لَآ أَعۡبُدُ مَا تَعۡبُدُونَ ٢
وَلَآ أَنتُمۡ عَٰبِدُونَ مَآ أَعۡبُدُ ٣ وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٞ مَّا عَبَدتُّمۡ ٤
وَلَآ أَنتُمۡ عَٰبِدُونَ مَآ أَعۡبُدُ ٥ لَكُمۡ دِينُكُمۡ وَلِيَ دِينِ ٦

سُورَةُ النَّصۡرِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ١ وَرَأَيۡتَ ٱلنَّاسَ
يَدۡخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفۡوَاجٗا ٢ فَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ
وَٱسۡتَغۡفِرۡهُۚ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابَۢا ٣

سُورَةُ المَسَدِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

تَبَّتۡ يَدَآ أَبِي لَهَبٖ وَتَبَّ ١ مَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُ مَالُهُۥ وَمَا
كَسَبَ ٢ سَيَصۡلَىٰ نَارٗا ذَاتَ لَهَبٖ ٣ وَٱمۡرَأَتُهُۥ
حَمَّالَةَ ٱلۡحَطَبِ ٤ فِي جِيدِهَا حَبۡلٞ مِّن مَّسَدِۭ ٥

٦٠٣

**لە لووتکەی دەسەڵاتدا تاریف و شوکری خوا بکە :**

ئادەمزاد هەرکە کەمێ بەرەو سەرکەوتن چوو، بە پێی سروشت قابیلە چەواشە ببێ و، خۆی لێبگۆڕێ، جابۆ ئەوە شتیوا روونەدا، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿بسم الله الرحمن الرحیم * [1] إذا جاء نصر الله والفتح﴾ هەرکە کۆمەکی خواهات و، دەرگای سەرکەوتن و زاڵبوون کرایەوە، واتە: مەککەت لەبت وبتپەرستیی ئازاد کردو زاڵبوویت بەسەر دوژمنانی دین و گەل و وڵاتدا ﴿[2] ورایت الناس یدخلون فی دین الله افواجا﴾ وديتت خەڵکی پۆل پۆل دێنە ناو دین و ئایینی خواوە، بەتایبەتی عەرەبەکان، پاش ئەوخۆگرتن و ململانێیە ﴿[3] فسبح بحمد ربك﴾ ئەوسا تۆیش زۆر بەدڵنیاییەوە پەروەردگاری خۆت بەپاك و بێخەوش ڕاگرە، واتە: لەسەر ئەو نازو نیعمەت و بەهرە گەورەیە پێی بەخشیویت هەمیشە سوپاسی بکە ﴿واستغفره﴾ و لەبەرامبەر هەندێ حاڵەت وبارودۆخ، کە بەسەر خۆت و هاوەڵانتدا دێت،داوای لێبوردنی لێبکە، وەیان نەوەك بەهۆی ئازاد کردنی شاری مەککەوە خۆبایی بوون سەر هەڵبدا، واتە: ئەگەرچی تۆ هەرگیز لەخۆبایی نابیت، چونکە تۆ پەروەردە کراوی دەستی خوایت، بەڵام با هاوەڵانیشت دەرس لەتۆوە وەرگرن ﴿إنه کان توابا﴾ بەڕاستیی ئەو خوایە زۆر تەوبە وەرگرو چاوپۆشیکارە، بەڵێ مرۆڤ دەبێ رووی پەشیمانی هەربۆدەرگای خوا بەرێ، بۆیە پەیامبەران پاش هیجرەت و جیهادێکی زۆرو بێ وچان، زیاتر سەری بەندایەتییان دانواندووەوداوای لێبوردنیان لەخوا کردووە. ئەوەتە پێغەمبەر ﷺ لەسووژدەو رکووعی نوێژەکانیدا بەردەوام دەیگوت: ((سبحانك اللهم ربنا وبِحَمْدِكَ، اللهم اغفرلي)). فتح

الباري:٦٠٥/٨. سا خوای بەخشندە بە بەزەیی و میهرەبانی خۆی لەئێمەش خۆش ببێ و،کارە چاکەکانمان لێوەرگرێ و، قەڵەمی بەخشینیش بەسەر تاوانەکانماندا بێنێ.

کۆتایی سوورەتی (نەصر)

***  ***  ***

## ١١١- سوورەتی (مەسەد)ـە

## مەککەییەو (٥) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتە باسی دوژمنایەتی وتیاچوونەکەی (ئەبولەهەب)ـی مامی پێغەمبەر ﷺ دەکات، ئەوەبوو زۆر بەقورسیی و سەختیی دوژمنایەتی پەیامبەری ﷺ ئەکرد و ماڵەو ماڵ بەدووی دەگەڕا، تا بەڵکو کارەکانی لێ تێك بداو، بە حیسابی خۆی بە درۆی بخاتەوە، مەبەستیشی لەوەدا هەرئەوە بوو کە مەردوم موسڵمان نەبن، جابەو بۆنەوە ئەم سورەتە هات تا ئەو رووداوە پڕبەپڕ بگێڕیتەوە، وە وەك ئیمامی (بوخاریی) دەڵێ: ئەو سوورەتە بەڵێنی ئاگرێکی بڵێسەدارو هەڵگیرساوی شایستە بە (ئەبی لەهەب) ئەدات، هاوڕێ لەگەڵ خێزانەکە یشیدا، بەشێوەیەك کەخەجاڵەت و ریسوایی لێوە دەردەکەوێ. وە هەروەها لە (ئیبن عەباس)ـە وە ریوایەت دەکات: کاتێ ئایەتی: (وانذر عشيرتك الأقربين) هاتە خوارێ، پێغەمبەر ﷺ چووە سەر گردۆڵکەی (سەفا) و بەدەنگێکی بەرز فەرمووی: ((یا بني فلان، یا بني فلان، یا بني فلان، یابنی عبدالطلب)) ئەگەر پێتان رابگەیەنم و بڵێم لەسەر ئەو کێوەوە سوارێکی زۆرتان بۆ دێت، ئایا بڕوام پێ دەکەن؟ وتیان: تا ئێستا درۆمان لێ نەبیستوویت، ئەویش فەرمووی: ((فإني نذير لكم بين يدي عذاب شديد)). ئەبو لەهەبیش وتی: یاخوا بەخێر نەیێت و تیابچیت هەر بۆئەمە کۆت کردوینەوە؟ پاشان بۆ مجرۆبوونی ئەوو ژنەکەی ئەم سوورەتە هات. فتح الباري:٦٠٩/٨.

### کەللەڕەقی ئەبوو لەهەب و جەزای خۆی و هاوسەرەکەی:

﴿بسم الله الرحمن * [١] تبت يدا ابى لهب﴾ یاخوا هەر دوو دەستەکانی (أبو لهب) بەبڕین چن و تیابچن، ﴿وتب﴾ خۆ تیاش چوو ﴿[٢] ما اغنى عنه ماله وما كسب﴾ ماڵ و سامانیی و، ئەوەی کەکردی لەدوژمنایەتی کردنی پەیامبەر ﷺ سوودێ پێ نەدا ﴿[٣] سيصلى نارا ذات لهب﴾ لەمەپاش دەچێتە ناوئاگرێکی بڵێسەدارەوەو دەسوتێ ﴿[٤] وامراته حمالة الحطب﴾ هاوڕێ لەگەڵ هاوسەرەکەیشیدا, هەڵگری کۆڵەداری فیتنەو، تێکدانی نێوان پەیامبەرو مەردم، چونکە ئەویش ماڵەو ماڵ ئەگەڕاو، ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد کە نەچنە سەر قسەی موحەممەد، سەرەڕای ئەوەش کۆڵە چیلکەی دڕکاویی دەهێناو لەسەر ڕێی پەیامبەردا دایدەنا، بۆئەوەی ئازار بچێژێ ﴿[٥] فى جيدها حبل من مسد﴾ لەگەردنیایەتی لە دۆزەخدا گوریسێکی چنراو لە پووشی خورما (پاش ئەوەی کە گەردنبەندی زێڕ لەگەردنیابوو).. بەڵێ ئەوانەی وا ئەزیەت و ئازاری موسڵمانان دەدەن، وە پارەو پوڵ بەخت دەکەن لە پێناوی لاوازکردن و فەوتاندنیاندا، ئەوە بۆ خۆیان پەنجەی حەسرەت و پەشیمانی دەگەزن و پەشیمان دەبنەوەو خەجاڵەت و ریسوا و زەلیل دەبن لە قیامەتدا، وە هەر دەبێ بە دوای (أبو لهب)دا بنێردرێن.

کۆتایی تەفسیری سوورەتی (مەسەد).

***  ***  ***

## ١١٢- سوورەتی ( ئیخلاص )ـه

## مەککەییییەو ( ٤ ) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتە باسی تەوحیدو هەندێ لە سیفەتە پیرۆزەکانی خوای کارزان دەکات، باسی تاك و تەنیایی و جێگەی تاکە ئومێدو هیوای رازو نیازی گش خەڵکان دەکات، باسی بێ نیازیی و بی ئاتاجیی و بێ هاوبەشی و بێ هاوتایی خوا دەکات، رەتی ئەوانە دەداتەوە کە دەڵێن: خوا لەسێ (ئوقنوم) پێکهاتووە، دەمکوتی ئەوانە دەکات دەڵێن: فریشتەوجنیەکان منداڵی خوان!. هۆی هاتنی ئەم سوورەتە: وەك (ئوبەی کوڕی کەعب) دەڵێ: هاوبەشدانەرەکان بەپێغەمبەریان ﷺ گوت: رشتەونەسەبی خوامان بۆ باس بکە! جا خوای بە دەسەڵات لەوەڵامدا ئەم سوورەتی: (قل هو الله احد..)ی نارد. (پێشەوائەحمەد، ترمزیی، ئیبن جەریر ریوایەتی دەکەن). وە لە فەزڵ و گەورەیی ئەم سوورەتەدا: ئیمامی (بوخاریی) لە (ئەبو سەعید)ەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((أیَعْجِزُ احدکم أن یقرأ ثلث القرآن فی لیلة؟)). ئایا ئێوە ناتوانن لەتەنها شەوێکا سێیەکی قورئان بخوێنن؟ هاوەڵان ئەوەیان لا گران و قوورس بوو، بۆیە ئینکاری ئەوەیان کردو وتیان: جا کێ دەتوانێ کاری وا بکات؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرموی: ((اللهُ الواحدُ الصمدُ ثلثُ القرآن)). فتح البری: ٨/٦٧٦. واتە: سوورەتی (صەمەد - ئیخلاص) سێیەکی قورئانە.

الجزء الثلاثون — سورة الإخلاص

سُورَةُ الإخلاص

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾ اللَّهُ الصَّمَدُ ﴿٢﴾ لَمْ يَلِدْ
وَلَمْ يُولَدْ ﴿٣﴾ وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُوًا أَحَدٌ ﴿٤﴾

سُورَةُ الفَلَق

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ ﴿١﴾ مِن شَرِّ مَا خَلَقَ ﴿٢﴾ وَمِن
شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ ﴿٣﴾ وَمِن شَرِّ النَّفَّاثَاتِ فِي
الْعُقَدِ ﴿٤﴾ وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ ﴿٥﴾

سُورَةُ النَّاس

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ ﴿١﴾ مَلِكِ النَّاسِ ﴿٢﴾ إِلَٰهِ
النَّاسِ ﴿٣﴾ مِن شَرِّ الْوَسْوَاسِ الْخَنَّاسِ ﴿٤﴾ الَّذِي
يُوَسْوِسُ فِي صُدُورِ النَّاسِ ﴿٥﴾
مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ ﴿٦﴾

٦٠٤

**ئاوا خوا بناسە!:**

ئەودەمە بتپەرستەکان داوای نەسەبی خوایان لەپێغەمبەر ﷺ کرد، خوای گەورە بۆ ئەو وەڵامە کورت و پوخت وەڵامی دانەوەو فەرمووی: ﴿بسم الله الرحمن الرحيم * [1] قل هو الله احد﴾ ئەی موحەممەد! ﷺ بڵێ: ئەو پەروەردگارەی کەمن دەیپەرستم، تاك وتەنیایەو، هاوەڵ و هاوبەشی نیە ﴿[2] الله الصمد﴾ ئەوخوایە کە ناوی (الله)یە، جێگای هیواو ئومێدو، بێ نیازیشە، هیچ کەسێکیش -بێ لەو- شای لێبوومەوەستەی ئەوە نییە گیروگرفتەکان ببرێنە لای بۆ چارەسەر، هەر ئەوزاتە گەورەیشە، کە دەبێ هەر بۆلای ئەو بگەڕێینەوە ﴿[3] لم يلد﴾ کەسی لێ نەبووەو، هیچ رۆڵەیەکی نیە - وەك جولەکەو گاورو بتپەرستەکان دەڵێن -، چونکە خوا زۆر بڵوند و پاك وبێخەوش ودوورەلەو جۆرە بیرو بۆچوونانە ﴿ولم يولد﴾ ولە کەسیش نەبووە وبێدایك و بابە، چونکە هەموو شتێکی لەدایك بوو تازەونوێیە و، خوا نیەو سەرەتایەکی هەیە، خۆ خوایش بێ سەرەتاو (ئەزەل)ییە ﴿[4] ولم يكن له كفوا احد﴾ وهەرگیز هیچ کەسێك هاوشێوەو هاوتای نیە و، کەسێ ناتوانێ بەر هەڵستی بکات. بەڵێ زۆر کەس لە دۆزینەوەو دیارییکردنی خاوەنی ئەم بوونەوەرەدا بەهەڵە چووو نەگەڕایەوە بۆ هەق، گومانیش لەوەدا نیە کە دەبێ

هەموو دروستکراوێك – گەورەو بچووك،وەكو ئەم بوونەوەرە – خاوەنێكی هەبێ، بەڵام ئایا كێیەو صیفەتەكانی چین و، دەبێ چۆن بێ؟ بەڵێ..لەدۆزینەوەی ئەم ڕاستیە خەڵكێك لەكۆن و تازەوە لێیان تێكچووە و بەهەڵە چوون و، هەر یەكەیان بە شێوودۆڵێكاملیان ناوە، بەڵام ئەگەر بیرێكی ورد لەشێوەو شێوازی دروستبوونی ئەم بوونەوەرە:(عاسمان وزەمین و شیوو دۆڵ و كێوو چیاو بەرزیی و نزمیی وشەوو ڕۆژو خۆرو هەیڤ وهەسارەكان و باو بۆران وتۆفان و گەردەلوول و سەرماو گەرماو باران و بەفرو تەرزەو دەریاوزەریاو هات وچۆی گەمیەكان بەناویاندا–كێو ئاسایی– و ئافەراندنی مرۆڤ خۆی، ئەمانەو صەد ئەوەندەی تریش لەم بوونەوەردا) زۆر بەئاسانی پەنجە دەخرێتە سەر ڕاستییەكان و ڕاڤەی ئەو هەقیقەتە دەكرێت، بۆیە ئێمەش زۆر بەدڵنیاییەوە ملكەچین وسەری بەندایەتیمان بۆ دانواند.

هەزار ڕەحمەت لە (حافیزی حەكەمیی/ ١٣٤٢ – ١٣٧٧ھ). كەلەبارەی ئاقیدەو بیرو باوەڕی موسلمانانەوە سەبارەت بە ناسینی زاتی عەلییەی خوا چەندە جوان دەڵێت:

أول واجب على العبيد — معرفة الرحمن بالتوحيد
إذ هو من كل الأوامر أعظم — وهو نوعان أيا من يفهم
إثبات ذات الرب جل وعلا — أسمائه الحسنى صفاته العُلى
وانه الرب الجليل الأكبر — الخالق البارىء والمصور
باري البرايا منشيء الخلائقِ — مبدعهم بلا مثال سابق
الأول المبدي بلا إبتداء — والآخر الباقي بلا إنتهاء
الأحد الفرد القدير الأزلي — الصمد ألبر المهيمن العليَ
عُلوَّ قهر وعلوالشأن — جل عن الأضداد والأعوان.

كۆتایی تەفسیری سوورەتی (صەمەد).

*** *** ***

## ١١٣- سوورەتی (فەلەق)ـە

## مەككەییەو (٥) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتە بەندە ڕاستەكانی خوا فێری دەكات كە: هەمووكات خۆیان بدەنە دەستی خواو پەنا هەربەو بەرن لەتەواوی شەڕو خراپەی خراپەكاران، بەتایبەتی لەزیانی تاریكە شەو كە پەردە بەسەر ڕووناكییەكاندا دەكێشێ، لەزیانی درۆزنان و دووڕووان، لە خراپەی جادوبازان و ساحیران، لەزیانی ئەوانەی كەچاویان هەر لەماڵی مەردمە.

### پەنا هەر بەخوایە لەگێچەڵی گێچەڵگێڕان:

مرۆ چەندە بەتواناو بەهێز بێت، هێمان هەر پێویستی بە پاڵپشتێكی وەك خوا هەیە، كە لەزیان و زەرەری گشت زیاندەرێ دڵنیای بكاو ئۆقرە بەگیانی بدات، بۆیە دەفەرموێ: ﴿بسم الله الرحمن الرحيم * [1] قل اعوذ برب الفلق﴾ ئەی موحەممەد! ﷺ بڵێ: پەنا دەبەمە بەر پەروەردگاری سپیایی بەرەبەیان، ئەوخوایەی كەپەردەی نەبوونی لەت كردوو بوونەوەری لێدەرهێنا ﴿[2] من شر ماخلق﴾ لە شەڕو خراپەی هەرچی كەدروستی كردووە، هەرشتێ خراپەی لێبووەشێتەوە ﴿[3] ومن شر غاسق إذا وقب﴾ وە لەشەڕو خراپەو زیانی تاریكی شەو، كە دادێت و هەموو شتێك

دادەپۆشێ بەژێرەوەو ترووسکایی لێ دەبڕی ودەبێتە شەوەزەنگ ﴿٤ ومن شر النفاثات فی العقد﴾ وە لەشەڕوخراپەو زیانی ئەوکەسانەی جادوودەکەن و فوو دەکەن بەگرێکاندا، چاوبەستکردنی موسڵمانان و، فێڵ و تەڵەکە کردن لێیان، ئێجگار کارێکی دزێوو نالەبارو بەدو خراپە، دەبێ هەموو کات پەنا بەخوا ببرێ و، هەوڵیش بدرێ تا خەڵکی زاڵ نەبن بەسەریاندا، جا بۆ پتر ئاگادار بوون لە(سیحر)وجادوو، بگەڕێوە بۆ سوورەتی (بەقەرە) ئایەتی: ١٠٢ ﴿٥ ومن شر حاسد إذا حسد﴾ وە لەشەڕو خراپەو زیانی هەر حەسودێك کاتێ حەسوودیی وئێرەیی دەباو، هەمیشەش هەر خەریکی زیان گەیاندنە بەموسڵمانان.

بەڵێ پێغەمبەر ﷺ ناساغیەکی تووش بوو، لەوکاتەدا فریشتە (جوبریل)هات وگوتی: (دەڵێی ناساغییت؟ فەرمووی: بەڵێ، جوبریلیش ئەم دۆعایەی بەسەرا خوێندەوەو فەرمووی: (بسم الله أَرْقِيكَ، من کل داء يؤذيك، ومن شر کل حاسد وعين، اللهُ يَشْفِيكَ). موسلیم: ٢١٨٦.

بەڵێ: مرۆڤ هەرچەندە دەسەڵاتدار بێت ناتوانێ هەر کون و قوژبنێك زیانی پێنەگەیەنێت لەخۆی بگرێ، بۆیە دەبێ هەمووکات پەنا هەر پەنای خوای باڵا دەست بێت.

کۆتایی تەفسیری سوورەتی (فەلەق).

(والحمدلله رب العالمین).

*** *** ***

## ١١٤- سوورەتی( ناس )ـە
## مەککەییەو ( ٦ ) ئایەتە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

سوورەتی(ناس) مرۆڤ فێری ئەوە دەکات کە هەمووکات هەر بەخوای گەورە پەنا بەرێ، لەگەڵ ئەوەیشدا هەندێ لە صیفاتیشی بۆ باس دەکاودەڵێ: خو(الله) پەروەردگاری هەموو خەڵکانە، پاشای تەواوی مرۆڤەکانە، تاکە (مەعبوود)و پەرستراوی بە هەقی بەندەکانە.

مرۆڤ فێر دەکا کەپەنا بەخوا بگرێ لە زیانی (ئیبلیس) و مرۆڤە لادەرەکان و شاگردەکانیان، ئەوانەی کە هەردەم لەچەواشە کردن و فریودانی ئادەمزادان.

### پەناهەرهی خوایە لەدەس جنۆکەو مەردمی بەد فەڕ:

بەڵێ خوای باڵا دەس برێ لە پەسن و صیفاتی پیرۆزی خۆی لەم سوورەتەدا باس دەکا، بۆ ئەوە مرۆڤ باشتر پشتی پێ ببەستێ و، لەخراپەی ئینس و جنیی بەدکردار بیپارێزێ ولێیان نەترسێت، بۆیە دەفەرموێ:﴿ بسم الله الرحمن الرحيم * ١ قل اعوذ برب الناس﴾ ئەی موحەممەد! ﷺ (ئەی موسڵمان!) بڵێ: پەنا ئەبەمە بەر پەروەردگاری خەڵك ﴿٢ ملك الناس﴾ پاشای خەڵك ﴿٣ إله الناس﴾ پەرستراوی خەڵك. ئەم سێ سیفەتە پیرۆزەی خوایە: (ڕەب، مەلیك، ئیلاه) لەسەرەتای سوورەتی (فاتیحە)شەوە هاتووە: (الحمد لله رب العالمین، الرحمن الرحیم، مالك یوم الدین)، یان (ملكِ یوم الدین)، هەروەك لەسەرەتای سوورەتی (بەقەرە)شەوە ئەفەرموێ: (یا أیها الناس اعبدوا ربكم الذی خلقكم والذین من قبلكم لعلكم تتقون * الذی جعل لكم الأرض فراشا والسماء بناء وأنزل من السماء ماء فأخرج به من الثمرات رزقا لكم فلا تجعلوا لله اندادا)، جا کاتێ کە تۆ قایل بوویت بە(ڕبووبییەت) ی خوای گەورە،

ئیتر دەبێ هەر ئەویش بە (إلـه) بزانیی و بیپەرستیی،وەکودەفەرموێ: (فليعبدوا رب هذا البيت..)، جا (ربوبیەت) و پەروەردگاریەتیشی لەگەڵ سوورەتی تردا دووپاتکراوەتەوە، وەك دەفەرموێ: (الحمد لله رب العالمين)(٢/١). (قل أغير الله أبغي ربا وهو رب كل شئ)(٦/١٦٤). (قل من رب السموات والأرض قل الله)(١٣/١٦، (رب المشرق والمغرب لا إله إلا هو فاتخذه وكيلا)(٧٣/٩)، (فليعبدوا رب هذا البيت..)، (إنما أمرت أن أعبد رب هذه البلدة)(٢٧/٩١. (رب العرش الكريم)(٢٣/١١٦). جا دوای باسی (ربوبیەت)ی خوا، باسی پاشایەتیی‌دێت ودەفەرموێ: (ملك الناس) تا مرۆ بزانێ کە ئەوخوایە، هـەروەك (رەب)ـە بۆهـەموو جیهانـەکان، خـاوەن و پاشایشـیانە، کـەوابوو زاتێکـی زۆر گـەورەو بەدەسەڵاتەو، شیاوی پشت پێبەستنە لەکاتی خۆشی و ناخۆشییدا، وە کە دەفەرموێ: (..اعبدوا ربكم الذى خلقكم والذين من قبلكم لعلكم تتقون)(٢/٢١-٢٢)، پاشان دەبێ دادن تـەنها بە (ئولوهیـەت)و حاکمیـەتی ئەویشدا بنرێ و، هەر فەرمانی ئـەویش بـەڕێوە ببرێت، بۆیـە دەفـەرموێ: (إلـه الناس)، یـان دەفـەرموێ: (وما خلقت الجن والإنس إلا ليعبدون)(٥١/٥٦). یان (قل اللهم مالك الملك..)(٣/٢٣. یان دەفەرموێ: (له الملك وله الحمد) (٦٤/١)، یـان (لـه ملك السموات والأرض..) ٢/١٠٧. یان (الملك القدوس) (٩٥/٢٣)، ئـەم هـەموو ئایـەتانـەو دەیـان ئایـەتی دی، هـەر هـەموو داوادەکەن و بەمرۆ دەڵێن کە: دەبێ تەنها خوا بپەرسترێ و، هەرلەویش گوێ رایەڵیی و بەرفەرمانی بکرێ، دەبێ لە مانـاو مەبەسـتی راستەقینەی (رەب، مـەلیك، ئـیلاە) وا تێبگـەین ﴿ مـن شـر الوسـواس ﴾ لەشـەڕو خراپـەو زیـانی دەغدەغـە دروستکـەرو وەسوەسـەکار ﴿الخنـاس﴾ کـە هـەر نـاوی خـوا بـرا و یـادی کـرا، ئـەو خـۆی پـەنهان دەکـات، زانایانی تەفسیر دەڵێن: شەیتان تەپدەکوتیتە سەر دڵی مرۆڤ ودەیکا بە خانەولانەی خۆی، هەتا خوا نەکا بەجێی ناهێڵێ. پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: هەموو مرۆیەك شەیتانێکی هاوڕێی‌هەیەو، لەگەڵیا هەڵدەسووڕێ و، هانی دەدا بۆ کاری خراپ، تەنانەتی منیش، بەڵام خوا منی زاڵکردووە بەسـەر هـاوڕێ شەیتانەکەمداو، ناتوانی کاری خراپم پێبکات/ موسلیم. ﴿ الذى يوسوس فى صدور الناس ﴾ ئەوەی وەسوەسـە دەخاتـە نـاو سینەو دڵـی مەردمەوە ﴿ من الجنة والنـاس ﴾ لەجنۆکـەو لـەئادەمیی، (ئەوانـەیان شـەیتان رەفتـارن) وەك دەفـەرموێ: (وكذلك جعلنا لكل نبى عدوا شياطين الإنس والجن يوحى بعضهم إلى بعض زخرف القول غرورا)، پێشـەوا (ئەحمـەد)یش ئـەم فەرموودەیـەی هێناوە: کە ئەبووزەر دەڵێ: جا رێك چومە مزگەوت، دەبینم پێغەمبەر ﷺ لەوێیە، پاشان دانیشتم و، فەرمووی: ((يا أبا ذر هل صليت؟)) واتـە:ئەبازەر! نوێژت کردووە؟ وتم: نـا، فـەرمووی: ((قم فصل)) واتـە:هـەر ئێستا هەستەو نوێژەکەت بکە، منیش نوێژم کردو پاشان فەرمووی: ((تَعَوَّذْ من شر شياطين الإنس والجن)) لـە شـەڕی شـەیاتینی ئادەمیی و جینی پـەنا بـەرە بـەرخوا. (ئەبوزەر) دەڵێ: گوتم: باشە! شـەیاتینی ئادەمیش هەیـە؟! فـەرمووی هەیـە. بەڵێ.. ئەم سوورەتە فێری ئەوەمان دەکات کە هەمووکات پەنا بەرینە بەر خوای گـەورە لـە هـەموو ئـیش وکارەکاندا، وەخۆمـان بپارێزین لەوانـەی دەیانـەوێ بە قسـەی لـووس وبێنـاوەڕۆك لەخشتەمان بـەرن، بەتایبـەت لـە ئادەمیـە شەیتان و شەیتانکارەکان، خۆ بێگومانە کە گەڵێ کەس هەیە لـە دێو (عیفریت) و جنۆکەکان، زۆر خراپترەو زیانی گـەورەترە، شـەیتانیش بـە شـارەگە خوێنبەرەکانـدا دێـت و دەچـێ و، بەشـی خۆیشـی دەسـەڵاتی دراوەتـێ، بۆیـە پێویستە مرۆڤ هەمیشە وریابێ وئاگای لـەخۆی بێ و شـەیتان فریوی نەدات. سا خوایا بەمیهرەبانی خۆت بمان پارێزە لەپیلانی جنۆکەو مرۆڤە دووڕوو و خراپەکارەکان و زمان لووسەکان بمانپارێزە، و لەسـەر ئاینەکـەی خۆت دامـەزراومان بکـەو هێزو پێزمـان بۆ زیاد بکە، تاباشتر بتوانین خزمـەتی ئیسلام ودینەکـەت بکـەین. پەیامبـەر ﷺ

هەموو شەوێ – کە دەچووە جێگای خەو بۆ نووستن– سێ جاران سوورەتی (قل هوالله)، (قل أعوذ برب الفلق)، (قل أعوذ برب الناس)ی دەخوێندو، فووی بەهەردوو دەسستیا دەکردوو بە هەموو ئەندامەکانی لاشەیدا دەیهێنا، بە تایبەت دەم و چاوو سەرو هەر جێگایەکی دی کە دەستی پێیدەگەیشت.

**لەکۆتاییدا:** زۆر زۆر سوپاس بۆ خوای میهرەبان کە بەنووسینی ئەم (تەفسیرە) کورتەیە بۆ قورئانە پیرۆزەکەی ڕێزی لێنام، ئەم نووسینەش لەسەر داخوازی گەلێ لەجوان و لاوەکانمان، ئەگینە قورئانی پیرۆز بەیەك بەرگ و دەبەرگیش نرخ و بەهای دەرناکەوێ، هێمان ئەمەش –بەم شێوە کەم وکورتەیە– پاش ئازارو بێزارێکی زۆرو، لە ساڵەکانی نەوەدەوە، ئەو فیکرو بیرەم کەوتە مێشکەوەو، ماخۆلانم بوو و دەموت خوایە! چۆن بتوانم پرۆسەیەکی ئاوای بەنرخ، بەتەنیا لەکوردستانێکی پڕ لەئاژاوەو بێ ئۆقرەو، پڕ لە سیاسەتی هەمە جۆرە تەواو بکەم، هەر ئەمەشبوو کە گەلێ جار ئەمیش بەر شالاوی رك وکینە دەکەوت و تۆڵە دەدرا، تەنانەتی پاش ئەوە کەخرایە (کۆمپیوتەر)ـەوەو تایپکرا، کەوتە دەستی گروپێك، بەهەزار قوربان و صەدەقەت بم، ئەوجا بەکەم وکورتیی و ناتەواوی دەستمان کەوتەوە! بۆیە ناچاربووم هەمیسان زۆربەی دابڕێژمەوەو، بگەڕێمەوە سەرەتاکەیی و، لەئەنجامدا ئەوەندەش دواکەوت خەریکە بڵێم لەکاتی خۆیدا فریا نەکەوت!.داوای لێبوردنیش دەکەم لەهەر کەم وکورتیی و ناتەواوییەك، وە هەرکەسێکیش هەرشتێکی بەرچاوکەوت، بەدۆستانە و بەدڵسۆزانە بەسەری بگرێتەوە، ئێمەش– لەگەڵ سوپاسدا– گوێ بیستی دەبین و جوهدو هەوڵەکەشی دەنرخێنین.

**تێبینی:** لەڕەمەزانی ساڵی (١٤١٣)ی کۆچیی، بەرامبەر بە ساڵی (١٩٩٢) زایینی دەستم کرد بەنووسینی ئەم کورتە تەفسیرە، وە لە (٤)ی مانگی سەفەری ساڵی (١٤١٨)ی کۆچیی، بەرامبەر بە (١٩٩٧/٦/٩) زایینی لەهەڵەبجەی شەهید لە(راگەیاندن)ی بزووتنەوەی ئیسلامیی لەکوردستان/ عێراق، لێبوومەوە. بەڵام بەهۆی پیاچوونەوەو زیادکردن و گۆرانکاری لە تەفسیرەکەدا تا کۆتایی ساڵی(١٤٢٦) کۆچیی بەرامبەر بە (٢٠٠٥) ی زایینی هەروا مایەوەو پاشان ئامادەی چاپکردن کرا. داواکارم لە خوای بەبەزەیی و میهرەبان لێمان وەرگرێ و، قەڵەمی بەخشین بێنێت بە سەر هەڵەکانماندا؟

**والحمدلله أولا وآخرا**

التفا سير و المصادر العربية :
١- تفسير القرآن العظيم - للإمام المحدث ابن كثير - دار المنار - دمشق - الطبعة الأولى ١٤١٩ - ١٩٩٩ .
٢- فى ظلال القرآن - سيد قطب - دار الشروق - بيروت - لبنان - الطبعة الرابعة والعشرون .
٣- تفسير القرطبى - للإمام محمد بن أحمد الأنصارى القرطبى - دار الفكر ١٤١٤ - ١٩٩٣ .
٤- أضواء البيان - للإمام الشنقيطى .
٥- تفسير الطبرى - للإمام المفسرين ابن جرير الطبرى .
٦- تفسير روح المعانى - للشيخ محمود شكرى الآلوسى .
٧- تفسير المنار - محمد رشيد رضا - دار المعرفة - بيروت - لبنان - الطبعة الثانية .
٨- الأساس فى التفسير - سعيد حوى - دار السلام - مصر - الطبعة الثالثة ١٤١٢ - ١٩٩١ .
٩- تفسير الكاشف - محمد جواد مغنية - دار العلم للملايين - بيروت - لبنان - الطبعة الثانية ١٩٧٨ .
١٠- تفسير الكبير - للإمام الفخر الرازى - الطبعة الإيرانية - الطبعة الثالثة .
١١- تفسير الكشاف - للإمام الزمخشرى - دار المعرفة - بيروت - لبنان .
١٢- تفسير البيضاوى -
١٣- تفسير المراغى -
١٤- تفسير مجمع البيان -
١٥- صفوة التفاسير - محمد على الصابونى - دار النمير - دمشق - الطبعة الأولى ١٤١٤ - ١٩٩٤ .
١٦- تفسير المقتطف - للدكتور مصطفى خرم دل - دار إحسان - طهران - الطبعة الأولى ١٤١٨ - ١٩٩٨ .
١٧- المصباح المنير فى تهذيب تفسير ابن كثير - جماعة من العلماء بإشراف الشيخ المباركفورى- دار السلام - الرياض- الطبعة الثانية ١٤٢١ - ٢٠٠٠
١٨- تفسير الكريم الرحمن فى تفسير كلام المنان - عبدالرحمن بن ناصر السعدى - مؤسسة الرسالة - بيروت - لبنان - الطبعة الأولى ١٤٢٠ - ٢٠٠٠

التفاسير الكردية - تەفسیرە كوردییەكان:
١- تەفسیری قورئانی پیرۆز - مامۆستا مەلا عوسمان عەبدولعەزیز.
٢- تەفسیری نامی - مامۆستا مەلا عەبدولكەریمی مودەرریس.
٣- تەفسیری خاڵ - شێخ محمدی خاڵ .
٤- تەفسیری وەرگێڕاوی كوردی - مامۆستا هەژاری موكریانی .

**** **** ****

١- فتح البارى - شرح صحيح البخارى - للإمام ابن حجر العسقلانى - دار السلام - الرياض - الطبعة الثالثة ١٤٢١ - ٢٠٠٠ .
٢- صحيح مسلم - بشرح الإمام النووى - دار الأحياء التراث العربى - بيروت - لبنان ١٤٠٨ - ١٩٨٨ .
٣- مجموعة الفتاوى - للشيخ الإسلام ابن تيمية - دار الوفاء - السعودية .. الطبعة الثانية ١٤١٩ - ١٩٩٩ .
٤- شرح أصول اعتقاد اهل السنة و الجماعة - للإمام اللالكائي - دار طيبة - السعودية - الطبعة الخامسة ١٤١٨ هـ - ١٩٩٨ .
٥- معارج القبول بشرح سلم الوصول - للشيخ حافظ الحكمي - دار ابن قيم - السعودية - الطبعة الثالثة ١٤١٥ - ١٩٩٥ .
٦- نواقض الإيمان الإعتقادية - د. محمد بن العبدالله بن على الوهيبي - دار المسلم - الرياض - الطبعة الأولى ١٤١٦ - ١٩٩٦ .
٧- نواقض الإيمان القولية و العملية - د. عبدالعزيز بن محمد بن على العبداللطيف - دار الوطن - الرياض - الطبعة الثانية ١٤١٥ - ١٩٩٥ .
٨- أعلام السنة المنشورة لإعتقاد الطائفة الناجية المنصورة - للشيخ حافظ الحكمى - دار الكتب العلمية - بيروت - لبنان - الطبعة الأولى ١٤٢٤ - ٢٠٠٣
٩- صبّ العذاب على من سبّ الأصحاب - للشيخ محمود شكرى الآلوسى - دار أضواء السلف - الرياض - الطبعة الأولى ١٤١٧ - ١٩٩٧ .
١٠- زاد المعاد فى هدى خير العباد - للإمام ابن القيم الجوزية - دار الفكر - بيروت - لبنان - ١٤١٥ - ١٩٩٥ .
١١- إعراب القرآن الكريم و بيانه - محى الدين الدرويش - دار ابن كثير - دمشق - بيروت - الطبعة الرابعة ١٤١٥ - ١٩٩٤ .
١٢- الصحيح المسند من أسباب النزول - الشيخ مقبل بن هادى الوادعى - دار ابن حزم - بيروت - لبنان - الطبعة الثانية ١٤١٥ - ١٩٩٤ .
١٣- أسباب النزول - للنيسابورى - عالم الكتب - بيروت .

| السُورة | رقمها | الصحيفة | البيان |
|---|---|---|---|
| الفاتحة | ١ | ١ | مكية |
| البقرة | ٢ | ٤ | مدنية |
| آل عمران | ٣ | ١١٥ | مدنية |
| النساء | ٤ | ١٧٢ | مدنية |
| مائدة | ٥ | ٢٣٧ | مدنية |
| الأنعام | ٦ | ٢٨٥ | مكية |
| الأعراف | ٧ | ٣٢٧ | مكية |
| الأنفال | ٨ | ٣٧٢ | مدنية |
| التوبة | ٩ | ٣٩٠ | مدنية |
| يونس | ١٠ | ٤٢٥ | مكية |
| هود | ١١ | ٤٤٨ | مكية |
| يوسف | ١٢ | ٤٧٢ | مكية |
| الرعد | ١٣ | ٤٩٩ | مدنية |
| إبراهيم | ١٤ | ٥١١ | مكية |
| الحجر | ١٥ | ٥٢٣ | مكية |
| النحل | ١٦ | ٥٣٦ | مكية |
| الإسراء | ١٧ | ٥٦١ | مكية |
| الكهف | ١٨ | ٥٨٨ | مكية |
| مريم | ١٩ | ٦١٣ | مكية |
| طه | ٢٠ | ٦٢٨ | مكية |
| الأنبياء | ٢١ | ٦٤٥ | مكية |
| الحج | ٢٢ | ٦٦٤ | مدنية |
| المؤمنون | ٢٣ | ٦٨٤ | مكية |
| النور | ٢٤ | ٧٠٠ | مدنية |
| الفرقان | ٢٥ | ٧٢٠ | مكية |
| الشعراء | ٢٦ | ٧٣٣ | مكية |
| النمل | ٢٧ | ٧٥٢ | مكية |
| القصص | ٢٨ | ٧٧٠ | مكية |
| العنكبوت | ٢٩ | ٧٨٨ | مكية |
| الروم | ٣٠ | ٨٠١ | مكية |
| لقمان | ٣١ | ٨١٠ | مكية |
| السجدة | ٣٢ | ٨١٧ | مكية |
| الأحزاب | ٣٣ | ٨٢٢ | مدنية |
| سبأ | ٣٤ | ٨٤٤ | مكية |
| فاطر | ٣٥ | ٨٥٤ | مكية |
| يس | ٣٦ | ٨٦٤ | مكية |
| الصافات | ٣٧ | ٨٧٥ | مكية |
| ص | ٣٨ | ٨٨٦ | مكية |
| الزمر | ٣٩ | ٨٩٧ | مكية |
| غافر | ٤٠ | ٩١٢ | مكية |
| فصلت | ٤١ | ٩٢٦ | مكية |
| الشورى | ٤٢ | ٩٣٦ | مكية |
| الزخرف | ٤٣ | ٩٤٧ | مكية |
| الدخان | ٤٤ | ٩٥٧ | مكية |
| الجاثية | ٤٥ | ٩٦٣ | مكية |
| الأحقاف | ٤٦ | ٩٦٩ | مكية |
| محمد | ٤٧ | ٩٧٨ | مدنية |
| فتح | ٤٨ | ٩٨٦ | مدنية |
| الحجرات | ٤٩ | ٩٩٧ | مدنية |
| ق | ٥٠ | ١٠٠٣ | مكية |
| الذاريات | ٥١ | ١٠٠٩ | مكية |
| الطور | ٥٢ | ١٠١٥ | مكية |
| النجم | ٥٣ | ١٠١٩ | مكية |
| القمر | ٥٤ | ١٠٢٥ | مكية |
| الرحمن | ٥٥ | ١٠٣١ | مدنية |
| الواقعة | ٥٦ | ١٠٣٨ | مكية |
| الحديد | ٥٧ | ١٠٤٤ | مدنية |
| المجادلة | ٥٨ | ١٠٥٣ | مدنية |

# تفسير رامان



## المفسّر في سطور

- ولد المؤلف الشيخ (أحمد كاكه محمود) في قرية (يالانبى) بمحافظة السليمانية في كوردستان العراق سنه ١٩٥٠ م.
- تخرج من المعهد الاسلامي في مدينة حلبجة سنة ١٩٧١ م.
- حاز على الإجازة العلمية عند الشيخ المجاهد والمفسر عثمان بن عبدالعزيز محمد (رحمه الله) سنه ١٩٧١.
- عين إماما وخطيبا في عدد من مدن وقرى كوردستان العراق في عام ١٩٧٣ و ١٩٧٩م الى أواخر الثمانينات. ففي هذه المدة إستمر على الخطابة والوعظ والدعوة بين الشباب في المساجد و المحافل و المراسيم الاسلامية. كما وألف مجموعة من الكتب التي يحتاج إليها الشباب و أهالي المنطقة باللغة الكردية، مثل: (الحرية في الإسلام، التربيه في الإسلام، العبادة في الإسلام، السياسة في الإسلام، الجهاد في الإسلام، السلام في الإسلام، والبيعه في الاسلام. ..الخ) إضافة الى مجموعة من المقالات والبحوث والفتاوى
- وفي سنة ١٩٨٧ شارك في تأسيس حركة إسلامية باسم الحركة الإسلامية في كوردستان ـ العراق. وكانت لهذه الحركة صولات في الجهاد والدعوة والتربية معروفة لدى مواطن كوردستان.
- توفي ضحى يوم الخميس ٦ - محرم ١٤٢٧ هـ الموافق ٢٥-١-٢٠٠٧ ، بمدينة حلبجة. جزاه الله خيراً . وإنا لله وإنا اليه راجعون .

### منهج الشيخ فى
### ا تفسير رامان فى معانى و مقاصد القرآن ا كالآتى:

* جمع فيه تفسير الآيات بالآيات و بالأحاديث و بقول الصحابى و التابعين .
* إبتعد عن رواية الإسرائيليات و ما لا أساس له فى التفاسير المعتبرة .
* إتبع فى معانى الأسماء والصفات على ما اتفق عليه من سلفنا الصالح .
* فصّل فى بعض المواضيع التى يحتاج الى التفصيل والتحقيق، فى مسائل العقدية، و إعتمد على المصادر الموثوقة.
* ذكر أسباب النزول فى ما له سند صحيح من الروايات .
* ذكر فى أول كل سورة مقدمة يبحث فيها مختصرا عمّا جاء فى السورة من الأحكام ، و التشريع ، و الوعد والوعيد .. الخ .
* يستنبط بعض الارشادات والتوجيهات لكثير من الآيات القرآنية، فى نهاية كثير من الآيات.
* حين تفسيره لحياة الانبياء عليهم الصلاة والسلام، يتبنى القصص الصحيحة التى تليق بمقامهم، ويضعف ماعداها من القصص والاحداث الموضوعة، مثل قصّة ا الغرانيق ا ، و ما جاء فى شأن يوسف و سليمان و داوود .. الخ .
* نشكر كل من أعاننا و سهل لنا الأمور فى إعداد هذا التفسير المختصر، و الحمد لله أولا و آخرا.

لمزيد من المعلومات راجع موقع الشيخ : www.ahmadkaka.com

ژمارەی سپاردنی ٨٤٤ی وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە

| السورة | رقمها | الصفحة | البيان |
|---|---|---|---|
| الحشر | ٥٩ | ١٠٦٠ | مدنية |
| الممتحنة | ٦٠ | ١٠٦٧ | مدنية |
| الصف | ٦١ | ١٠٧٢ | مدنية |
| الجمعة | ٦٢ | ١٠٧٥ | مدنية |
| المنافقون | ٦٣ | ١٠٧٨ | مدنية |
| التغابن | ٦٤ | ١٠٨١ | مدنية |
| الطلاق | ٦٥ | ١٠٨٤ | مدنية |
| التحريم | ٦٦ | ١٠٨٩ | مدنية |
| الملك | ٦٧ | ١٠٩٤ | مكية |
| القلم | ٦٨ | ١١٠٠ | مكية |
| الحاقة | ٦٩ | ١١٠٦ | مكية |
| المعارج | ٧٠ | ١١١٠ | مكية |
| نوح | ٧١ | ١١١٤ | مكية |
| الجن | ٧٢ | ١١١٨ | مكية |
| المزمل | ٧٣ | ١١٢٤ | مكية |
| المدثر | ٧٤ | ١١٢٨ | مكية |
| القيامة | ٧٥ | ١١٣٢ | مكية |
| الإنسان | ٧٦ | ١١٣٧ | مدنية |
| المرسلات | ٧٧ | ١١٤١ | مكية |
| النبأ | ٧٨ | ١١٤٤ | مكية |
| النازعات | ٧٩ | ١١٤٨ | مكية |
| عبس | ٨٠ | ١١٥٢ | مكية |
| التكوير | ٨١ | ١١٥٥ | مكية |
| الإنفطار | ٨٢ | ١١٥٨ | مكية |
| المطففين | ٨٣ | ١١٥٩ | مكية |
| الإنشقاق | ٨٤ | ١١٦٢ | مكية |
| البروج | ٨٥ | ١١٦٥ | مكية |
| الطارق | ٨٦ | ١١٦٧ | مكية |
| الأعلى | ٨٧ | ١١٦٨ | مكية |
| الغاشية | ٨٨ | ١١٧٠ | مكية |
| الفجر | ٨٩ | ١١٧٢ | مكية |
| البلد | ٩٠ | ١١٧٤ | مكية |
| الشمس | ٩١ | ١١٧٧ | مكية |
| الليل | ٩٢ | ١١٧٩ | مكية |
| الضحي | ٩٣ | ١١٨١ | مكية |
| الشرح | ٩٤ | ١١٨٣ | مكية |
| التين | ٩٥ | ١١٨٤ | مكية |
| العلق | ٩٦ | ١١٨٦ | مكية |
| القدر | ٩٧ | ١١٨٧ | مكية |
| البينة | ٩٨ | ١١٨٩ | مدنية |
| الزلزلة | ٩٩ | ١١٩٠ | مدنية |
| العاديات | ١٠٠ | ١١٩٢ | مكية |
| القارعة | ١٠١ | ١١٩٢ | مكية |
| التكاثر | ١٠٢ | ١١٩٤ | مكية |
| العصر | ١٠٣ | ١١٩٥ | مكية |
| الهمزة | ١٠٤ | ١١٩٦ | مكية |
| الفيل | ١٠٥ | ١١٩٧ | مكية |
| قريش | ١٠٦ | ١١٩٨ | مكية |
| الماعون | ١٠٧ | ١١٩٨ | مكية |
| الكوثر | ١٠٨ | ١١٩٩ | مكية |
| الكافرون | ١٠٩ | ١٢٠١ | مكية |
| النصر | ١١٠ | ١٢٠٢ | مدنية |
| المسد | ١١١ | ١٢٠٣ | مكية |
| الإخلاص | ١١٢ | ١٢٠٤ | مكية |
| الفلق | ١١٣ | ١٢٠٥ | مكية |
| الناس | ١١٤ | ١٢٠٦ | مكية |